بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

بەناوی الله ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

حەمدو سوپاس بۆ ئەو زاتەی کە منەتی نا بەسەرمانداو پەڕاوێکی بۆ رەوانە کردین کە هەموی نورو روناکیو هیدایەتە کە مرۆڤی لەتاریکاییەکانی کوفرو بت پەرستیو خۆپەرستیو نەفامی رزگارکردو گەیاندیە راستە رێگای ئیمانو خواپەرستیو خۆناسیو زانیاری، بەراستی پەروەردگار ئەوەندەی نیعمەت پێداوین کە ژماردنی لەتوانای ئێمە دا نیە چ جای سوپاسکردنی، من تەنها ئەوەندە دەتوانم کەسەری بەندایەتی بۆ ئەو زاتە بەرزو بەشکۆیە لەخاك بنێمو بڵێم:

( يَا رَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَعَظِيمِ سُلْطَانِكَ

/ئەی پەروەردگارم هەربۆ تۆیە تەواوی سوپاس بەوشێوەی کە شیاوی شکۆی زاتتوگەورەیی دەسەڵاتت بێ).

دیارە لەسەر زەوی دا هیچ پەڕاوێك وەك قورئان پێداچونو لێکۆڵینەوەو نوسینی لەسەر نەکراوە تا ئەو شوێنەی کە زانایان سەدان بەشی زانیاریان لەبارەی ئەم پەڕاوە بەنرخەوە دامەزراندوە، جا ئێمەش لێرەدا بۆ براو خوشکانی هاوزمانمان بەکورتی مانایەکی رونی دەخەینە پێش چاوتان بەهیوای سود لێ وەرگرتن.

وتراوە بناغەی زانیاریەکانی قورئان بەگشتی سێ بەشە، یەکەم: تەوحیدو یەکخوا ناسی، کە ناسینی ناوو سیفەتو کردارەکانی پەروەردگارە کە ناسینی مەخلوقاتیش کە نیشانەگەلێکن لە سەر ناسینی ئەو زاتە دەگرێتەوە، دووهەم: ئامۆژگاریو وەبیرخستنەوەیە کە باس لە بەڵێنەکانو هەڕەشەکانی پەروەردگارو بەهەشتوجەهەنم دەکات، سێهەم: ئەحکامە شەرعیەکانە کە چۆنیەتی عیبادەتەکانو رونکردنەوەی سودەکانو زیانەکانو فەرمان بە چاکەوبەرگری لە خراپە دەگرێتەوە جا بۆیە سورەتی ئیخلاص کە باس لە تەوحید دەکات بە یەك بەش لە سێ بەشی قورئان دانراوە و سورەتی فاتیحەش کە هەر سێ بەشەکەی تێدایە بە " **أم الكِتاب**" واتە: بە بناغەو ئەصڵی قورئان ناوبراوە، بەڵام ئەگەر بمانەوێ بە تاك باس لەو هەمو عیلمو زانیاریە سەرسوڕهێنەرانە بکەین کە لە قورئانداندایەوتائێستا زانراوە لە راستیدا بەژمارە نایەتو هەموان لەو ئیشە پەك کەوتودەبین، چ جای ئەو هەمو زانیاریانەی کە هێشتا پەردەیان لەسەر لانەدراوە،

﴿وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَ / کلیلەکانی تەواوی نهێنیەکان هەر لەلای خۆیەتی، جگە لە خۆی کەس نایزانێ﴾ .

## قورئان کەلامی پەروەردگارە:

هەر لە سەردەمی دابەزینی قورئانەوە زۆر بون کەسانێك کە هەوڵیان دەدا کە بڵێن ئەم قورئانە قسەی پەروەردگاری جیهان نیە ، جا دەیان گوت ئەم قورئانە قسەی محمد خۆیەتی بەڵام کاتێك کە موعجیزەکانی پێغەمبەریان دەدی دەیان گوت: ئەم پیاوە ساحیرێکی زانایە، ئەوەی کە بەلاغەتو پاراوەیی قورئانی دەبینی دەی گوت: ئەمە شاعیرێکی زۆر بەتوانایە یان کاتێك پێغەمبەر باسی زیندوبونەوەو حیسابو کیتابی قیامەتی دەکرد دەیان گوت: ئەمە شێتە،واتە: شێتێکی زاناو قسە زان! بەڵێ ئەوانەی کە مەبەستیان تەنها بەرنگاری کردنە جا بەهەر شێوەیەك بێت بەڵگەو قسەکانیان هەر ئاوا دور لە هەمو بناغەیەکی عیلمیو عەقڵیە. دیارە ئەوەی کە موسڵمانو کافر لە بارەی قورئانەوە لەسەری یەك دەنگن ئەوەیە کە ئەم قورئانە لە سەر زمانی کەسێکی نەخوێندەوار لە سەدەی شەشەمی زایینی لە شاری مەکە کە موحەمەدی کوڕی عەبدوڵای ناو بوە هاتوە، جا ئەم کتێبە پیرۆزە کە ئاوا گەلی عەرەبی ـ کە لەو پەڕی نەزانیو نەفامیدا بوون ـ بەرز کردەوەو شارستانیەتێکی وای پێك هینا کە زلهێزانی فارسو رۆم بەرەنگاری ئەوەیان پێ نەکرا، خۆ لە هەر سەردەمێکدا هەر گەلێك بە چاکی دەستی پێگرتبێت سەربەرزو سەربەخۆو خاوەن شەرەف بون، وە رۆژ لە دوای رۆژ بە پێش کەوتنی عیلمو زانیاریەکانی بەشەر هەر رۆژ موعجیزەیەکی ئەو کتێبە پیرۆزە دەردەکەوێتو کۆنە بونی بەسەردا نایەتو لەهەر سەردەمێکدا گەلانێك پەوەردەدەکات کە چاکی خۆیان لە خزمەت کردنی مرۆڤدا دەبینن، پرسیار ئەمەیە کە سەرچاوەی ئەم کتێبە بەنرخە کوێیە و کێیە؟ ئێمەی باوەڕدار باوەڕمان وایە کەلامی اللەیە کە رەوانەکراوە بۆ محمد ﷺ کە دوا نێرراوی الله یە، پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ

إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ /الأعراف: ٢٠٣ / وە هەرکاتێك کە تۆنیشانەیەکیان نیشان نادەیت ئەوان دەڵێن: دەی خۆت بۆ هەڵی نابەستیتو بۆمان باس بکەیت؟ بڵێ: من هەر پەیڕەوی لەوە دەکەم کەبۆم دێت لەلایەن پەروەردگارمەوە، ئەمە چاورۆشنیەکە لەلایەن پەروەردگارتانەوەو رێنمایو رەحمەتە بۆ ئەوگەلەی کەباوەڕدێنن﴾ وە هەروەها باوەڕمان وایە جیا لە مانای قورئان، وشەکانی قورئانیش لەلایەن پەروەردگارەوە نیگا کراوەتە لای محمد ، جا ئەوەتە پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ قُرۡءَٰنًا عَرَبِيّٗا /یوسف: ٢ / واتە ئێمە ئەم قورئانەمان بە زمانی عەرەبی رەوانە کردووە﴾

دیارە ماناو واتا عەربیو عەجەمی نیە بۆ نمونە وشەی "ا ء" وشەیەکی عەرببە خوێندنەوەو جۆرو ژمارەی پیتەکانی لەگەل وشەی " ئاو" کە وشەیەکی کوردیە جیاوازە، بەڵام مانای هەردو وشەکە یەکە کە ئەوەش خواردنەوەیەکی ناسراوە کە کوردیو عەرەبی بۆ نیە بەڵام لەهەر زمانێکدا وشەیەك دانراوە بۆ گەیاندنی ئەو مانایە هەروەها وشە گەلێکی وەك : ﴿ ٱقۡرَأۡ / بخوێنەوە /العلق ١: ﴾ یان ﴿ وَرَتِّلِ / المزمل:٤ ﴾ یان ﴿ وَٱتۡلُ /الکهف : ٢٧ ﴾ وە یان جوڵانەوەی زمان﴿ لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ /القيامة: ١٦ ﴾ هەمو دەستەواژانێکن کە بۆ وشە بەکار دەهێنرێت نەك بۆ مانایەکی روت،جا کاتێك دەڵێین ئەم قورئانە بە عەربی دابەزیوە مانای ئەوەیە کە وشەکانی وەحیەکن لە لایان پەروەردگارەوە ئەگینا مانا کوردیو عەرەبی بۆ نیە ، جا ئەمە بە پێچەوانەی ئەوەی کە هەندێك کەدانیان ناوە بەو ماناو مەفهومە گەورانەی کە لە قورئاندا هاتوە بەڵام لەلایەکی ترەوە حەقو راستیان لێ ون بووەو دەڵێن: قورئان ماناکەی هی خودایە بەڵام وشەکانی هی محمدە! بەڵام هەندێکی تر بە پێچەوانەی ئەمانە کە لە رەوان بێژیو زمان پاراوەیی قورئان سەریان سوڕماوە دەڵێن: مانا هی محمدە بەڵام وشەکان هی پەروەردگارە، جا بۆمەبەستی خۆی ئایەتی بیستەمی سورەتی تەکویری دەکرد بە بەڵگە کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ /الحاقة: ٤٠ ﴾ جا دەی گوت: واتە ئەم قورئانە قسەی پێغەمبەرە، لەحاڵێکدا پێش هەمو شتێك مەبەست لە﴿ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴾ لێرەدا جبرەئیلە نەك پێغەمبەر کەئایەتی پاش خۆی رونی دەکاتەوەو کە دەفەرموێ: ﴿ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ /التكوير: ٢٠ ﴾ واتە ئەمە قسەی جبرەئیلە کە نێرراوێکە قسەی پەروەردگار بە محمدﷺ رادەگەیەنێت، جا چونکە بە هۆی جبرەئیلەوە دابەزیوە قسەکە دراوەتەلای جبرەئیل ئەگینا ئەو هەر نێرراوێکە و بەس، جا ئەگەر باوەرت بەو ئایەتە هەیەو دەیکەیت بە بەڵگە دەبێت باوەریشت هەبێت بەم ئایەتە کە ئەو ئایەتەت بۆ مانا دەکاتەوەو دەفەرموێ:﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ١٩٢ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ١٩٣ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ١٩٤ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ١٩٥ ﴾ بەڵی بێ باوەڕان دەیانگوت جنۆکەکان دەستیان لێ وەشاندوەو شێت بووە ئەوەی کە دەیڵێت قسە گەلێکن کە هەر ئەو شەیتانانە پێی دەگەیەنن ،جا پەروەردگار بەم ئایەتانە بەرپەرچی دانەوە کە ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ١٩ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ٢٠ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ٢١ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ٢٢ /التكوير/ بەڕاستی ئەم قورئانە قسەی ڕەوانەکراوێکی بەڕێزە کە هەرگیز خۆی لە قسەی بچوكو ناڕێك نادات کەئەم قورئانەی لەبەیتولعیزەوە بەفەرمانی خوا گەیاندۆتە محمد ﷺ کەخاوەنی هێزەو لەلای خاوەنی عەرش بە شکۆو پایەبەرزە کەبەگوێکراوە لەناو فریشتەکانداو لەوێدا بەدەمو دەست پاك دەیناسن، مەبەست جوبرەئیلە کە واسیتەیە لەنێوان خواو پێغەمبەرماندا ﷺ و کەلامی خوای هێناوە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ و خاوەن هێزە کەهیچ شتێك ناتوانێت دەست بخاتە ناوکاریەوەو ئەمینەو بە ڕێكوپێکی پەیامەکەی گەیاندوە، ئینجا دەفەرموێ: وەبەڕاستی ڕەفیقەکەی ئێوە کە محمدە ﷺ شێت نیەو قسە لە خۆیەوە ناکات بەڵکو بەڕاستی لەسەر سەریەوە بە ڕۆشنی جبرەئیلی بینیوە، وە ئەو (محمدە ﷺ ) سەبارەت بەو شتە نهێنیانەی کە بۆی هاتوە ڕژد نیەو بە هەمو کەسێکی ڕاگەیاندوەو هیچ شتێکی نەشاردوەتەوە، وە ئەو قورئانە قسەی شەیتانی تارێنراو نیەو ناتوانێت شتێك لەو بارەوە بڵێت﴾ وەك لە سورەتی (الشعرا) ئایەتی (٢١٠-٢١٢)دا دەفەرموێ: ﴿شەیتانەکان نەیانهێناوەو بۆیان نیە کەشتی وا بکەنو ناتوانن چونکە ئەوان بەرگری کراون لە گوێگرتن﴾.

ئەمڕۆ بە هۆی پێشکەوتنی زانیارییەوە هەرکەسێك کە خاونی عەقڵو دەرونێکی زیندوبێت کاتێك تەماشای ئایەتەکانی قورئان دەکات هیچ ڕێگا یەکی بۆ نامێنێتەوە جگە لەوەی کە بڵێت: ئەم قورئانە سەرچاوەی زاتێکی زاناو کاربەجێیە کە ئاگای لە هەمو نهێنیەکانو رابردوو داهاتوو هەیە، بۆنمونە عیلمی ئەمڕۆ بەهۆی بەکار هێنانی زانیاریو ئامێرانی پێشکەوتوی ئەمڕۆ لەپاش دۆزینەوەو ناسینی "کروموسوم" بۆیان دەرکەوت کە پیاو خاوەنی دوو جۆری جیاوازی کروموسوم بە ناوی ئیکسو وایە((x y بەڵام کروموسومەکانی ئافرەت هەر لە جۆری(x)ە جا بەگشتی کاتێك کروموسومی ئافرەت لە گەڵ کرموسومی (x)ی پیاودا یەك دەگرێت ئەوا کۆرپەکە مێ دەبێت، بەڵام کاتێك لە گەل کرموسومی (y) پیاوی یەکبگرن ئەوە کۆرپەکە کوڕ دەبێت ئەم زانیاریانە ئەوەدەگەیەنێت کە لەراستیدا نێرو مێ بونی کۆرپە دەگەڕێتەوە بۆ ئاوی پیاو کە تا سەدەی بیستەم وەك زانیاریەکی عیلمی مرۆڤ لێی بێئاگا بوو ، بەڵام دەبینین قورئان زیاتر لە هەزارو چوارسەد ساڵ پێش ئەم بنەما علمیەمان لە سورەتی نەجمدا بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ٤٥ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ٤٦﴾ واتە لە تۆی پیاو نێرو مێی دروستکرد. یان ئەو کەسەی کە شارەزایی لە جوغرافیا دا هەبێت چاك دەزانێت دەستەواژەی ﴿أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ/الروم: ٣﴾ لە قورئان بۆ ناوچەی بەحرولەیت زۆر شیاوەو عیلمی ئەمڕۆ ئەوەدەسەلمێنێت چونکە ئەو شوێنە قوڵترین وشکای زەویە کە سێسەدو نەوەدو پێنج میتر لە ئاستی دەریادا قوڵترە یان دەبینین قورئان کاتێك کەباسی پاشای میسر لە سەردەمی یوسفی پێغەمبەردا دەکات بە شا "الملك" ناوی دەبات بەڵام کاتێك باسی پاشای سەردەمی موسا دەکات بە فیرعەون ناوی دەبات. جا کاتێك توانرا کە نوسینەکانی کۆن لەلایەن زانایانەوە بخوێنرێتەوە بۆیان دەرکەوت کە لەقەبی فیرعەون لە سەردەمی نۆێ لە بنەماڵەی هەژدەهەمی پاشایەتی میسرەوە دەست پێدەکات کە لەپێشدا ئەم ناوە نەبوە! یان ئەم قورئانەی کە لەماوەی بیستوسێساڵ لە کاتو ساتانێکی جیاوازدا دابەزیوە کەچی سەرەتاییو کۆتایەکەی لەوپەڕی هەماهەنگیو ڕێكو پێکی دایە تەنانەت لە ژمارەی پیتەکانو وشەکانیشیدا ئەو هەماهەنگیە ڕێكو پێکە رونو ئاشکرایە! ئایا پیاوێکی نەخوێندەوار لە سەدەی شەشەمی زاینیدا دەگونجێ کەخاوەنی ئاوا عیلمێکی وردودەقیق بێت لە بووارەکانی زیندوەرناسیو جوغرافیاو کۆمەڵ ناسیو مێژوو ڕەوان بێژیدا؟ بەراستی هیچ خاوەن عەقڵێکی بە ویژدان شتی وا نالێت بەڵکو حەق هەر ئەوەیە کەبڵێت: ﴿وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا /النساء: ٨٢/ ئەگەر ئەم پەڕاوە لەلایەن جگە لە خوداوە بوایە بەدڵنیاییەوە ناڕێکییەکی زۆریان تێدا بەدی دەکرد﴾

## باشترین تەفسیری قورئان:

تەفسیری وەحی بە وەحی متمانە پێکراوترینو باشترین شێوەی لێکۆڵینەوەو تەفسیر کردنە، چونکە ئەوەی کە لە ئایەتێکدا بە سەرجەمو تێکڕایی باسکراوە لە ئایەتێکی دیکەدا بەدرێژی باسی هاتوە یان ئەوەی کە لەئایەتێکدا حوکمەکەی بەگشتی هاتوە ئایەتێکی ترتایبەتی دەکاتەوە یان حوکمی واهەیە کە لە ئایەتێکدا هیچ مەرجێکی بۆ دیاری نەکراوە بەڵام لە ئایەتێکی تردا مەرجی بۆدانراوە واتە تەفسیری قورئان بە قورئان، بەشێکی تر لە تەفسیری وەحی بە وەحی لێکۆڵینەوەو تێگەیشتن لە قورئان لە ژێر تیشکی فەرمودەکانی پێغەمبەردایە ﷺ چونکە هەڵسوکەوتی پێغەمبەر ﷺ بەگشتی وێنەی عەمەلی قورئان بوە وەك دایکی باوەڕداران دەڵێت:{كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ/أ د. صحح الألبا / ئەخلاقی پێغەمبەر قورئان بوە. هەروەها اللەی باڵادەست دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ / النحل : ٤٤/ ئەم قورئانەمان ناردوە بۆت تا تۆش ڕۆشنی بکەیتەوە بۆخەڵك ئەوەی کە ڕەوانە کراوە بۆیان﴾ ئەم ئایەتە تێمان دەگەیەنێت کە یەکێك لە ئەرکەکانی سوننەت رون کردنەوەی قورئانە، جا کاتێك پەروەردگار بەڵێنی داوە کە قورئان بپارێزێت بەشێك لەو پاراستنە پاراستنی روشنکەرەوەکەیەتی کە سوننەتی پێغەمبەرە ﷺ کەواتە بەڵێنی پاراستنی سونەتیشی پێداوین ،

بەڵێ ئەوەی لە ئایەتێکدا بەکورتی باسی کراوە دەبینین لە سوننەتی پێغەمبەردا کە بەشێك لە وەحیە رون کراوەتەوە بۆ نمونە حوکمی دز لە قورئان ئاوا باس کراوە ﴿ وَٱلسَّارِقُ

وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا /المائدة:٣٨ / پیاووئافرەتی دز دەستەکانیان ببڕن ﴾ ئەم ئایەتە بەگشتی باس لە حوکمی هەمو دزێك دەکات ، بەڵام سوننەت بۆمان رون دەکاتەوە کە ئەوشتە دزراوە دەبێت لای کەم چارەکی دینارێك نرخی هەبێت‌و لە جێگای تایبەتی خۆیدا بێت‌و ماڵی گشتی نەبێت، هەروەها رونی دەکاتەوە کە مەبەست بڕینی دەست لە جومگەدایە، بەڵێ قورئان بە زمانی عەربی پاراو دابەزی جا عەربەکان لەمانای رونی قورئان زۆر بەباشی تێدەگەیشتن بەڵام جاری وایشبووە کە پێویست دەکرا بۆ تێگەیشتن لە ماناو مەبەستی ئایەتانێك پرسیار لە پێغەمبەرﷺ بکەن تا بۆیان رون بێتەوە کە مەبەست چیە، بۆ نمونە:کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ ﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ /الأنعام: ٨٢ ﴾

هاوەڵان وتیان: ئەی پێغەمبەرﷺ کام لە ئێمە تۆشی تاوان‌و زوڵم نەبوە؟ جا پێغەمبەرﷺ بۆی رون کردنەوە کە مەبەست لە زوڵم شیرکە. وەهەروەها رونکردنەوەی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لەسەر هۆی دابەزینی ئایەتەکان هۆکارێکی گرنگن بۆ لێکۆڵینەوەو تێگەیشتنی ئایەتەکان، چونکە ئەوان لە کاتی دابەزینی ئایەتەکان‌و هۆکاری دابەزینیان بە باشی لێی ئاگادار بون، دیارە کەسێك بە باشی لەواتاو مەبەستی وتەیەك تێدەگات کە بزانێت لە چ بارودۆخێکداو بە چ هۆکارێك ئەو قسە کراوە، جا بۆیە تێگەیشتنی ئەوان لە ئایەتەکان لە هەمو تێگەشتنەکانی تر بەنرخترەو پێویستە رەچاو بکرێن ئەگینا زۆر نزیکە کە لەماناو مەبەستی ئایەتەکە وەك خۆی تێنەگەین. ئەسلمی کوڕی عیمران دەڵێت: کاتێك روبەڕوی سوپای رۆمیەکان بوینەوە یەکێك لەموسڵمانان بەتەنهایی هێرشی کردەسەر سوپای رۆمییەکان خەڵك کە بینایان گوتیان: **لاإله إلاا** نەدەبو ئاوای بکردایە خۆی بەدەستی خۆی، خۆی لەناوبرد، واتە: مەبەستیان ئایتی ١٩٥ی سورەتی بەقەرە بو کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تُلۡقُواْ بِأَيۡدِيكُمۡ إِلَى ٱلتَّهۡلُكَةِ ﴾ بەڵام ئەبوئەیوب کە یەکێك لەیارانی پێغەمبەر بو کاتێك بینی کە ئەو خەڵکە ئایەتەکەیان بەم شێوە مانا کردەوە وتی: { **إنمَانَزلتْ هَذِهِ الآيةُ فِينَا مَعْشَرَ الأنصَار لما نَصَرَ اللهُ نَبيهُ وَأَظْهَرَ الإسْلاَمَ قُلنا هَلم نُقِيمُ فِي أموَالِنَا وَ نُصْلِحُهَافَأنزَلَ اللهُ تَعَالى وَ أنفِقُوا فِي سَبِيلِ اللهِ وَ لاَتُلقُوا بِأيدِيكُمْ إلى التهْلُكَةِ فَالإلقَاءُ بِالأيدِي إلى التهْلُكَةِ أنْ نُقِيمَ فِي أموَالِنَاوَنُصْلِحَهَا وَ نَدَعَ الجِهَادَ** / ئەم ئایەتە هەر لەسەر ئێمەی ئەنصار دابەزی، کاتێك الله پێغەمبەری یارمەتیداو ئیسلامی سەرخست وتمان: جا با ئێمەش بڕۆین لەمەولا دەستبگرین بە ماڵ‌و سامانمانەوەو هەوڵ بدەین بۆ چاك کردنی جا ئەم ئایەتە دابەزی، واتە: مەبەست لە "لەناوچون" مانەوەیە لەناو ماڵ‌و سامان‌و وازهێنانە لە جیهاد نەك شەهادەت لەسەر ئاینی خوا. بەم شێوەیە ئەبو ئەیوب تێی گەیاندن کە مەبەستی ئایەتەکە چیەو بۆچی دابەزیوە، وەیان لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا چەند کەسانێك دەستیانگرت بە ئایەتی ٩٣ی سورەتی مائیدەوەکە دەفەرموێ:﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ...﴾

جا ئەمەیان کرد بەبەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەگەر کەسێك باوەڕدارو خاوەنی کرداری چاك بێت ئەوا لە خواردنەوەی شەراب توشی تاوان نابێت کە ئەمەش بە هۆی بێ‌ئاگاییان لە هۆی دابەزینی ئایەتەکەبوو کە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا هاتوەکە ئایا ئەوانەی لە پێشدا شەرابیان خواردەتەوە پێش حەرام بونی‌و مردوون لەلایەن پەروەردگارەوە تاوانێکیان لە سەر هەیە؟ جا ئەم ئایەتەدابەزی، ئەمە نمونەیەك بو بۆ ئەوەی کە هەرکەس بیەوێت لە قورئان تێبگات پێویستە ئاگای لەو روداوو هۆکارانە هەبێت کە ئایەتەکانی بۆ دابەزیوە. سوپاس بۆ الله، ئێمەش لەم تەفسیرەدا تائەوجێگایەی توانیومانە لەسەر ئەم سێ خاڵە رۆیشتوین بەڵام بۆ ئەوەی کە کورتی تەفسیرەکە پارێزراوبێت زۆرجار ئایەتێکمان بەیارمەتی لەئایەتێکی تر ماناکردوەتەوە بە بێ ئەوەی بە راشکاوی ئاماژەمان پێکردبێت هەندێ جاریش لەبەرهۆکارانێك بە باشمان زانیوە بە رونی ئاماژە بە ئایەت یان ئایەتەکان بکەین بەڵام بەهۆی دور کەوتنەوە لە تەفسیری قورئان بە سوننەت زۆرتر هەوڵماندا‌وە کە فەرمودەکان بهێنینەوە وە لە هۆکاری دابەزینی ئایەتەکان ئەوەی کە پێمان راست‌و صەحیح بوە ئاماژەمان پێکردوە.وە خراپترین تەفیسر ئەو تەفسیرەیە کە بە بیروڕای شەخسی‌و بە بێ دەستگرتن بە روناکی سوننەت‌و

تێگەیشتنی سەلەفی صالحی ئەم ئومەتە لێکۆڵینەوەو تەفسیر لە سەر ئایەتەکان بکرێتەوە، تەفسیر کردنی قورئان بەم شێوەیە حەرامەو هۆکاری لەناوچونی ئومەتە وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {هَلاكُ أُمتي في الكِتاب وَاللبَن قالوا يَارَسُولَ اللهِ مَاالكِتَابُ وَاللبَنُ؟ قالَ يَتَعلمُونَ القُرْآنَ فَيَتأولُونَهُ عَلى غَيْرمَاأُنزَلَ اللهُ عَزوَجَل وَيُحِبونَ اللبَنَ فَيَدَعُونَ الجَمَاعَاتِ وَالجُمَعَ وَيَبْدُونَ/أ د،صحح الألبا / لەناوچونی ئومەتەکەم بەهۆی ئەم پەڕاوەو شیرەوەیە وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مەبەست لەو پەڕاوەو شیرە چییە؟ فەرموی: ئەم قورئانە دەزانن ، جا بەکەیفی خۆیان مانای دەکەن بێ ئەوەی کە لەسەرئەومانایە بێت کە خوای دەسەلاتدارو باشکۆ ڕەوانەی کردوە، وەشیریان خۆش دەوێت بەدوای مەڕوماڵات دەکەونو ڕوو لەچۆڵاییو بیابانەکان دەکەن ، ئەوسا وازلەجەماعەت وجومعە دەهێنن}

جا بۆیە پیاوانی سەلەفی ئەم ئومەتە دەیان گوت:{أي سَماءٍ تُظِلنِي وأي أرضٍ تُقِلنِي إذا قلتُ في كتابِ الله مالا أعلمُ ؟ کام ئاسمان سێبەرم بۆ بکاتو کام زەوی هەڵم گرێت هەرکاتێك بەبێ زانیاری لەپەڕاوەکەی خوادا شتێك بڵێم؟}

بەڵێ نوسەری هەموکیتابەکان هەر لە سەرەتای کتێبەکەیدا باس لە کەمو کوڕی کتیبەکەی دەکات ، بەڵام بەپێچەوانە هەر تەنها قورئانە ڕو لە هەمو بونەوەر دەکاتو بێباکانە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ﴾ /البقرة : ٢/ ئەوقورئانە هیچ گومانێکی تێدانیە ﴾ بەڵام ئەوەی کە ئێمە وەك تەفسیرو لێکۆڵینەوەیك بە پێی عیلمو زانیاری خۆمان لەم تەفسیرەدا باسمان کردوە خاڵی لە هەڵە نیە، جا ئەوەی ڕاست بو لەلایان الله وراستیو دروستی فەرمودەی پێغەمبەرەکەیەتی و هیوادارین کە لێمان وەرگرێت وە ئەوش کە هەڵەیە لە ئێمەیە و داوای لێخۆشبون لە پەروەردگارمان دەکەینو لەلوتفی وا چاوەڕێ دەکەین کەبۆمان بگۆڕێتەوە بەچاکە چونکە مەبەستێکی خراپمان نیە.

## کۆکردنەوەی قورئان :

**کۆکردنەوەی قورئان بە چوار مانا هاتوە:**

یەکەم لەبەرکردنی قورئان: کە ئەمە هەر لە شەخسی پێغەمبەردا ﷺ ڕوی داوە، هەروەك الله دەفەرموێ: ﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ/ الجمعة:٢/ خۆی(خوا) ئەو زاتەیە کە لەناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ ڕەوانەکردن کە نیشانەکانی خودا دەخوێنێتەوە بەسەریانداو پاکیان دەکاتەوە لە نەفامیو بت پەرستیو فێری ئەم قورئانەیان دەکات ئەگەرچی پێش ئەم قورئانە لە سەرگەردانیەکی ئاشکرای وادا بون کە لە داروبەرد هەیکەلی جۆراوجۆریان دەتاشیوپاشان بەندایەتیان بۆدەکردنو لێیان دەپاڕانەوەو لێیشیان دەترسان؟!﴾

گەلی عەرب پێش هاتنی ئیسلام گەلێکی نەخوێندەواربوونو نەیاندەتوانی ئەوەی کە دەیانەوێت بینوسن جا ئەوەی کە دەیانویست بیپارێزن، لەبەریان دەکرد وەك لەنیشانەکانی پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ ئەوە بوو کە ئەویش نەخوینەواربوو تا هیچ گومانیك نەبێت لەوەی کە پێغەمبەر هێناویەتی لە خوێندەواری خۆیەتی بەلکو پەیامێکی خواییە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەرکات ئایەتەکانی قورئانی بۆ دادەبەزی زۆر بەخێرایی دووبارەی دەکردنەوە لە ترسی لە بیری چونەوە بەڵام پارێزگاری لە قورئان کاری زاتێکە کە توانایی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە ، جا بۆیە بە پێغەمبەرەکەیﷺ فەرمو: ﴿لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ ١٦ إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ ١٧ فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ ١٨ /القيامة/ هیچ تەکانێك بە زمانت مەدە بۆ ئەوەی پەلەبکەیت بە خوێندنی ئەم قورئانە (مەترسە لە لەبیرچونەوەی) چونکە بەڕاستی ئێمە ئەو قورئانە کۆدەکەینەوەو بۆت دەخوێنینەوە، جا هەر کاتێك ئێمە خوێندمانەوە بۆت لەڕێگای جبرەئیلەوە ئەوسا تۆیش بەدوای خوێندنەوەی ئەودا برۆ و لەکاتی خوێندنیدا تەنها گوێ بگرەو بێ دەنگ بە و قسە مەکە ﴾ جا پێغەمبەرﷺ بەوشێوەی کە قورئانی بۆ ڕەوانەکراوە بەبێ ئەوەی شتێك لەبیر بکات یان لەبیری بچێت هەموی بە ئومەتەکەی ڕاگەیاندوە مەگەر ئەوەی کە ویستی الله ی لە سەربێت کە لەبیری پێغەمبەرﷺ بباتەوە وەك دەفەرموێ﴿ سَنُقۡرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ... /الأعلى :٦/ئێمە بۆت دەخوێنینەوە ئەوسا لەبیرت ناچێت مەگەر ئەوەی کە خوا ئارەزۆی لێبێت﴾ بەڵام

لەدوای ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ ئەوئایەتەی راگەیاندوە بە یارەکانیو ئەوانەی کە نوسەر وەحی بوون دەیان نوسی دەگونجێت وەك مرۆڤ ئایەت یان ئایەتانێکی لەبیر کردبێت بەڵام خوای گەورە بەبیری هیناوەتەوە ئەگەرچی بە هۆی یارەکارەکانیشی بێت. دایکمان عایشە دەڵێت: {سَمِعَ النبي ﷺ قارئًا يَقْرأُ مِنَ الليل فِي المَسْجِدِ فَقالَ: يَرْحَمُهُ ا ُ، لَقَدْ أذْكَرَني كَذا وَكَذا آيَةً أسْقَطْتُها مِنْ سُورَة كَذَا وَكَذا. و رواية: أُنسِيتُها./البخاري/ پێغەمبەرﷺ لەشەودا گوێی لێ بو یەکێك لەمزگەوتدا قورئانی دەخوێندەوە ،جا فەرموی: رەحمەتی خوای لێ بێت بەراستی فلانو فلان ئایەتی لەسورەتی فلانو فلانداکەلەبیرم چو بو خستییەوەبیرم . لەریوایەتێکی تردا:لەبیرم برابویەوە.}

ئەوەوەی لە مانای"كنت أُنسِيتُها"دەڵێت: (دَلِيلٌ على جَواز النِّسيان عَلَيهِ فيمَا قَد بَلغَه إ الأمَة/ بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە دروستە شتێك کەبە ئومەتەکەی راگەیاندبێت لەبیری بچێتەوە) چونکە ئەویش لەمبارەوە وەك خەڵکی تر وایە، بەڵام ئەوەندەی جیاوازە کە ئەو ئاگادار دەکرایەوە بەو شێوەی کە خوا خۆی ئارەزۆی لێبوایە هەر وەکو ئیجتهادەکانی ، وە ژمارەیەکی زۆر لە یارانی پێغەمبەرﷺ هەر بە بیستنی قورئان لە پێغەمبەرەوەﷺ لەبەریان دەکرد هەرلە "بئر معونة"نزیکەی حەفتا لە حافیزانی قورئان کوژراون.

دیارە ئەمانە ئەوەی لە قورئان تا ئەوکاتە دابەزیوە لەبەریان بووە، وە لەروداوی یەمامەیشدا کە لەسەردەمی ئیمامی ئەبوبەکر لە ساڵی یازدەی کۆچی رویداوەلە سوپای موسڵمانان نۆسەدوشەست کەس شەهید کران کە زیاتر لە شەش سەد کەسیان لە یارانی پێغەمبەرﷺ بوون جا لەم روداوەدا نزیکەی پێنج سەد کەس کە قورئانیان لەبەر بوو کوژران. ئەگەرچی ئەوەی کە ئەم ئومەتە دەمبەدەمو سینگ بە سینگو جیل بە جیل قورئانیان لەیەکتر بیستوەوبەو بیستنە لەیەکتریان وەرگرتوەکەگەورەیو شەرفێکی تایبەتە بۆ ئەم ئومەتە بەڵام هەر لە سەردەمی هاتنەخوارەوەی قورئاندا بە هۆی گرنگی پێدانی پێغەمبەرﷺو یارەکانی بە قورئانی پیرۆز دەیشنوسرایەوە ئەوە بو هەرکاتێك قورئان دادەبەزی پێغەمبەرﷺ نوسەرانی وەحی بانگ دەکرد تا بینوسن جا وشەیەك بوایە یان

سورەتێکی تەواو. زەیدی کوڕی سابت دەڵێت: لای پێغەمبەر دا ﷺ بوم کە وەحی بۆهات جا پێی فەرموم:{اُكْتُبْ/بنوسە}ئینجامنیش لە ئێسکی شان (کتف)دا نوسیم:﴿لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ... /النساء :٩٥ ﴾ تا کۆتای ئایەتەکە ئیبنوئومی مەکتوم کە پیاوێکی کوێر بو وتی: ئەی پێغەمبەرﷺئەی ئەوانەی کە جیهادیان پێناکرێت چۆنن؟ جا دووبارە وەحی دابەزیوئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {اقرأْ يَا زَيْدُ/ئەی زەید ئایەتەکە بخوێنەرەوە} منیش خوێندمەوە:﴿ لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾جا پێغەمبەر فەرموی:﴿ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ ﴾ زەید دەڵێت: ئەم وشەیە پەروەردگار بەتەنهایی رەوانەی کرد ، جا منیش لە جێی خۆی لە ئایەتەکەدا دامنا کە پێشتر نوسی بووم(ابوداود، الألبا : حسن صحيح) وە لە ئیبنوعەباسەوە هاتوە کە لە بارەی سورەتی ئەنعامەوە دەڵێت : {هِيَ مَكيَةُ، نُزلَتْ جُملةً وَاحدةً، نُزلَت ليلاً، وَكَتبوهَا مِن لَيلَتِهِم / زاد المسـ علم النفس ، اسن التأويل/ ئەوسورەتە مەکەییە کە بە شەو بەیەکجار دابەزیوەو هەر لەو شەوەیشدا نوسیویانە}

زەیدی کوڕی سابت دەڵێت:{كُنَاعِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ نُؤلِفُ القُرآنَ مِنْ الرقاعِ/الترمذي، صحه الألبا / ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺدا قورئانمان کۆ دەکردەوەو لە پارچە ئێسكو شتیوادا دەمانوسییەوە }

بەڵێ یارانی پێغەمبەر لە چیدا بۆیان دەرەخسا وەك پێستو ئێسك قورئانیان دەنوسیوە واتە هەرلە سەردەمی پێغەمبەرﷺ دا قورئان نوسراوە ئەگەرچی هەموی لە یەك بەرگدا کۆنەکراوەتەوە چونکە قورئان بەردەوام لەماوەی زیاتر لە بیست ساڵ دا دابەزیوە.

کۆکردنەوەی ئایەتەکانی هەر سورەتو دانانی لە جێی خۆیدا لەو سورەتەدا: جبريل عليه السلامکە دادەبەزیو ئایەتانێکی دەهێنایە خوارەوە رێنمایی پێغەمبەریﷺ دەکرد کە ئەم ئایەتانە سەر بەکام سورەتنو شوێنەکەی کوێیە پاشان پێغەمبەر بە نوسەرانی وەحی فەرمانی دەدا کە ئەو ئایەتانە لەو شوێنانەدا دابنێن.

قازی ئەبو بەکری باقلانی دەڵێت: (تَرتيبُ الآياتِ أمرٌ واجبٌ، وحُكمٌ لازمٌ، فَقَد كانَ جِ يلُ يَقول: ضَعُوا آيةَ كَذا في

مَوضِع كذَا/ لا هان علوم القرآن/ دانانی ئایەتەكان لەجێگای خۆیاندا كارێكی پێویستەوبڕیارێكی چەسپاوە چونكە بەراستی جبرەئیل دەیفەرمو: ئایەتی فلاَنی لەجێگای فلاَنیدا دابنێن)

بێگومان ڕێكخستنی ئایەتەكانی هەرسورەتو دانانی هەركام لە شوێنی خۆی دا بەفەرمانی الله بوە بەو شێوازەی كە ئەمڕۆ لە قورئاندا نوسراوەتەوە بە بێ ئەوەی كە هیچ گۆڕانكاریەكی بەسەردا هاتبێت و فەرمودەكەی ئیمامی عوسمان یان ئەوەی زەیدی كوری سابت كە پێشتر باسكرا بەلگەن لەسەر ئەوەی كە شوێنی ئایەتەكانو ڕێكخستنیان بڕیارێكی وەستێنراوە(أمر توقيفي) ، هەروەها بەلگەیەكی تر كە ئەوە دەسەلێنێ كە شوێنی ئایەتەكان هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺدا دیاری كراوە ئەوە یە كە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: { أُعْطِيتُ خَوَاتِيمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مِنْ بَيْتِ كَنْزٍ مِنْ تَحْتِ الْعَرْشِ/احمد، صححه الالباني/ كۆتای سورەتی بەقەرە لە ماڵێكی غەزانەوە لە ژێر عەرشدا پێم بەخشراوە } یان ئەوەی كە عومەری كوڕی خەتاب دەڵێت:{مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ ا ـ ﷺفِي شَيْءٍ مَا رَاجَعْتُهُ فِي الْكَلَالَةِ، وَمَا أَغْلَظَ لِي فِي شَيْءٍ مَا أَغْلَظَ لِي فِيهِ، حَتى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِي صَدْرِي فَقَالَ: يَا عُمَرُ أَلا تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِي فِي آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ/مسلم/ نەگەڕاومەتەوە لای پێغەمبەر ﷺ بۆپرسیاری هیچ شتێك بەوئەندازەی كە بۆ مەسئەلەی كەلالە گەڕامەتەوەلای لەهیچ شتێكیشدا توند نەبوە لێم بەو ئەندازەی لەو بارەوە توندبوە لێم هەتا بەپەنجەی دای لەسینگمو فەرموی: ئەی عومەرئایا ئەوئایەتەی هاوین كەلەكۆتای سورەتی نیساء دا یە بەست نیە؟} كەواتە هەر لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ شوێنی ئایەتەكانی هەر سورەت دیاری كراوە. عەبدوڵای كوڕی زوبەیر دەڵێت: { قُلْتُ لِعُثْمَانَ هَذِهِ الآيَةُ الَّتِي فِي الْبَقَرَةِ ﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾ قَدْ نَسَخَتْهَا الأُخْرَى فَلِمَ تَكْتُبُهَا؟ قَالَ: تَدَعُهَا، يَا ابْنَ أَخِي لا أُغَيِّرُ شَيْئًا مِنْهُ مِنْ مَكَانِهِ/البخاري/ وتم بەعوسمان ئەم ئایەتەی كە لەبەقەرەدایە﴿وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿غَيْرَ إِخْرَاجٍ﴾ بەراستی ئایەتەكەی تر هەڵیوەشاندوتەوە جا بۆنوسیوتە؟ وتی: وازی لێ بهێنە ئەی برازام من نامەوێ شتێك لەوقورئانە بگۆڕم لەجێگای خۆیدا} ئەم فەرمودەیە بەراشكاوی ئەوە پیشاندەدات كە یارانی پێغەمبەر ﷺچۆن شوێنی ئایەتەكانیان وەرگرتوە لە پێغەمبەرەوەﷺ هەربەو شێوە نوسیویانەتەوە و باوەڕیان وابوە كە ئێرە جێی ئیجتهادو بۆچون نییە.

**كۆكردنەوەی یەك لەدوایەكی هەمو سورەتەكانو دانانی هەركام لە شوینی خۆیدا لەیەك پەڕاودا:** هیچ گومانێك لەوەدا نییە كەدانانی هەر ئایەتێك لە شوێنی خۆیدا ئەمرێكی تەوقیفیەو بە فرمانی پێغەمبەرﷺبوەو هیچ ئایەتێكیش پێش‌وپاش نەكراوە، وە ئەمە كۆی دەنگی زانایانی ئیسلامی لەسەرە بەلاَم لەسەر ئەوەی كە ڕێكخستنی سورەتەكان یەك لەدوای یەك بەوشێوەیە كە بە فاتیحە دەست پێ بكاتو پاشان بەقەرەو ئینجا ئالی عیمران تا بە ناس كوتای پێدێت ئایا ئەوویش پێغەمبەر ﷺ بوە یان یارەكانی پێغەمبەر بەئیجتهادی خۆیان ئاوا ڕێكیانخستون، لە نێوان زانایاندا ناكۆكی هەیە هەندێك: پێیان وایە ئەمە بە ئیجتهادی سەحابە بوە بەلاَم هەندێكیتر پێیان وایە ڕێكخستنی سورەتەكان جگە لە سورەتی تەوبەو ئەنفال بە فەرمانی پێغەمبەرﷺ بوە وەك بەیهەقیو سیوتی، هندێكیتر پێیان وایە ڕێكخستنی هەمو سورەتەكان یەك لەدوای یەك هەر بە فەرمانو شوێنكەوتنی پێغەمبەر بوەو ئەمەش لە حەق نزیكترە ، چونكە پەروەردگار قورئان كە كەلامی خۆیەتیو گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرەكەیەتیﷺو ڕۆشنترین هیدایەتە خۆی كۆكردنەوەكەی بەئەستۆ گرتوە وەك دەفەرموێ:﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ /القيامة﴾جا بێگومان كۆكردنەوەی قورئان دەبێ بەوشێوەیە بێت كە الله پێی رازییەو ویستی لەسەریەتی جا الله چاكترین پیاوان دەكات بە ئەسبابی بەجێهێنانی وەعدەكەی خۆی، دیارە ئەوەی كە یارانی پێغەمبەر لە شێوەكانی تری ڕێكخستنی سورەتەكان و ڕێكخستنیان بەگوێرەی دابەزینیان وازیان هێناوەو لەسەر ئەم شێوازە كۆ بونەتەوە خۆی رونترین بەلگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەم شێوازی ڕێكخستنی سورەتانە لە سەر بنەمایەكی بتەو بوو، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { إِن اللَّهَ تَعَالَى قَدْ أَجَارَ أُمَّتِي مِنْ أَنْ تَجْتَمِعَ عَلَى ضَلَالَةٍ / ابن أ عاصم، حسنه الالبا . السلسة الصحيحة/ بێگومان الله ئومەتی منی پاراستوە لەوەی كەلەسەر گومڕاهی یەكبگرن}

وە دیارە چاکترین ئومەت یارانی پێغەمبەرن ﷺ، کە لە ئەنجامدا هەموویان لە سەر ئەو پەڕاوە(قورئانە) کە عوسمانی کوڕی عەفان کۆی کردەوە یەکدەنگبون. بەڵێ لە دوای ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ کۆچی دوایی کرد دابەزینی قورئانیش تەواو بو، جا بۆ ئەوەی کە قورئان هەموی لە یەك پەڕاودا کۆبکرێتەوە هەمو شت ئامادەبوو لە سەردەمی ئەبوبەکر دا لە دوای روداوەکەی موسەیلەمەی دۆرزن کە ئیدیعای پێغەمبەرایەتی دەکردو سوپایەکی سەد هەزار کەسی پێکهێنابوو نزیکەی پێنجسەد کەس لە قورئان خوێنانی قورئان لەبەربو کوژران ، جا ئەمە وای کرد کە عومەری کوڕی خەتاب داوا لە ئەبوبەکربکات کە قورئان هەموی لە یەك پەڕاودا کۆبکرێتەوەو وتی:{إِن الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُراءِ الْقُرْآنِ وَإِني أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَ الْقَتْلُ بِالْقُراءِ بِالْمَوَاطِنِ./البخاري/بێگومان لەرۆژی یەمامەدا کوشتارێکی زۆرهەبوو لەناو ئەوکەسانەی کە قورئانیان لەبەربوو بەراستی من دەترسم لەجێگای تردا ئەوکوشتارە لە ناو قورئان لەبەراندا زۆرببێ‌و بونی قورئان بکەوێتە مەترسییەوە}

جا پاش ئەوەی کە ئەبوبەکر دڵی لەسەر ئەم قسەی عومەرە سەقامگیر بو بە زەیدی کوڕی سابت کە لە نوسەران‌و حافیزانی قورئان بو وتی:{إِنكَ رَجُلٌ شَاب عَاقِلٌ وَلا نَتهِمُكَ، كُنتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اِ ؟ فَتَتبع الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ/ بێگومان تۆگەنجێکی ژیری‌و گومانی خراپت لێ ناکەین، تۆ وەحییت بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەنوسیەوە؟ جاتۆ بەدوای قورئاندا بڕۆو کۆی بکەرەوە}

ئەبو عەبدورەحمانی سەلەمی دەڵێت:{ قرأ زيد بن ثابت على رَسُول اِ ﷺ العام الذي توفاه ا فيه مرت ، وإنما يَت هذه القراءة قراءة زيد بن ثابت؛ لأنه كتبها لَرسُول اِ ﷺ، وقرأها عليه وشهد العرضة الأخ ة، وكان يقرئ الناس بِها ح مات، ولذلك اعتمده أبو بكر وعمر ه، وولاه عثمان كتبة ا صاحف./ البرهان في علوم القرآن/ زەیدی کوڕی سابیت لەوساڵەی کە پێغەمبەری خواﷺ وەفاتی تێدا کرد دووجار قورئانی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺخوێندۆتەوە هەر لەبەر ئەوە ئەم خوێندنەوە ناونرا خوێندنەوەی زەیدی کوڕی سابیت چونکە بۆ پێغەمبەری خوایﷺ نوسیوەتەوەو بۆی خوێندوەتەوەو ئامادەی دواترین رانواندن بوە و بەوشێوەیەش بەخەڵکی دەوت هەتا وەفاتی کردوە و هەر لەبەر ئەوەیشبو کە ئەبوبەکرو عومەر پشتیان پێ بەست لەکۆکردنەوەی قورئاندا، وە عوسمانیش کردی بەسەرپەرستی نوسەرانی قورئان}زەید هەستا بۆ ئەم ئیشە پیرۆزەو بە هاوکاری هەندێ لە یارە بەرێزەکان وەك عومەری کوڕی خەتاب‌و ئوبەیەی کوڕی کەعب، هەمو قورئانی کۆ کردەوە ، جا ئەم پەڕاوە لە سەردەمی ئەبوبەکردا لای ئەبوبەکرو پاشان لای عومەر هەڵگیرا لە پاش عومەریش درابە دەستی کچەکەی کەحەفصەی خێزانی پێغەمبەربوو(خوالێی خۆشبێ)، بەڵام دوای ئەوەی کە وڵاتی ئیسلامی بەربڵاو بویەوەو لەهەندی شوێندا لە سەر شێوازی خوێندەوەی قورئان ئیختیلاف‌و ناکۆکی دروست بوولەسەردەمی عوسمانی کوڕی عەفاندا، حوزەیفەی کوڕی یەمان کە لە فەتحی ئەرمینیاو ئازەربیجان لە ساڵی بیست‌و پێنجی کۆچی هاوبەشی کردبو دی کەخەڵکی شام‌و خەڵکی عێراق هەرکام بە شێوازێکی جیاواز قورئان دەخویننەوەو ناکۆکی زۆریان لە نێوان دروست بوە جا کاتێك گەڕایەوە بۆلای عوسمان داوای لێکرد کە ئەم ناکۆکیە لابات و پێی وت: {يا أَمِ َ الْمُؤْمِنِ َ، أَدْرِكْ هَذِهِ الْأمةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتِلَافَ الْيَهُودِ وَالنصَارَى/البخاري/ ئەی پێشەوای باوەڕداران فریای ئەم ئومەتە بکەوە پێش ئەوەی کە ناکۆکیان تێبکەوێت لەبارەی ئەم قورئانەوە وەك ئەوناکۆکیەی کە کەوتە نێوان جولەکەو گاورەوە}

جا عوسمان بۆ ئەوەی ئەم ناکۆکیە کە نزیك بو فیتنەیەکی گەورەی لێبکەوێتەوە بنبڕ بکات دوانزەکەس کە لەوانە زەیدی کوڕی سابت‌و ئۆبەیەی کوڕی کەعب و سەعیدی کوڕی عاص بون رای سپاردن کە لە روی ئەو پەڕاوەی کە لەلای حەفصەی خێزانی پێغەمبەرەﷺ پەڕاوانێکی تر بنوسرێت تا بۆ هەروڵاتێك دانەیەك بنێررێت تا لە کاتی رودانی هەر ناکۆکیەك لە خوێندنەوەی قورئاندا بۆ ئەو پەڕاوە وەك سەرچاوەیەك بگەڕێنەوە، مەبەستی عوسمان لەم ئیشە کۆ کردنەوەی موسڵمانان لەسەر ئەو شێوازە خوێندنەوانە بوو کە لە پێغەمبەرەوە ﷺ سابت بوە کەهیچ پێش‌و پاشێکی تێدانیەو خاڵی لەو حوکمانەیە کە خوێندنەوەکەی سڕاوەتەوەو جبرەئیل ﷺ بەو شێوازە دوو جار لە ئاخرین رەمەزانی عومری

پێغەمبەرﷺدا بۆی خوێندوەتەوە، جاپاش تەواو بونی نوسینی پەڕاوەكە عوسمان هەر پەڕاوێكی لە گەڵ یەك لەوانەی كە شارەزای باشیان لە خوێندنەوەی قورئاندا هەبوە نارد بۆ وڵاتانی ئیسلامی، خوا جەزای بەخێری هاوەڵانی پێغەرمبەری ئازیزمانﷺبداتەوە بۆئەوخزمەتە گەورانەی كە كردویانە بەئاینەكەی خواو پێغەمبەرەكەی و موسڵمانان.

## الله قورئان دەپارێزێت

ئومەتی ئیسلامی بەتێكڕایی باوەڕی وایە كە قورئان كەلامی الله یەو ئەوەی باوەڕی پێی نەبێت كافرە وەك پەروەردگار دەفەرموێ:﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥ﴾ /هود: ١٧/ هەركام لەوانە كەباوەڕی پێنەكەن ئەوسا ئاگرجێگایەتی﴾ جا ئەم پەراوە پیرۆزە كە گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەرەﷺ پەروەردگار بەڵێنی داوە كە هەرچۆنێك خۆی رەوانەی كردوە هەرئاواش خۆی بیپارێزێت وەك دەفەرموێ:﴿..نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ﴾ /الحجر: ٩/ بێگومان ئێمە خۆمان ئەم قورئانەمان رەوانە كردوەو بێگومان هەر خۆیشمان دەیپارێزین ﴾ جا بە بێ كەمو زیاد گەیشتوەتە دەستی ئێمە بەڵام ئەوانەی كەچاوی بینینی سەربەرزی ئومەتی ئیسلامیان نەبوو رقو قینێكی زۆریان لەدڵدابو بەرامبەر بە هاوەڵانی پێغەمبەر كە هەڵگرانی ئاڵای ئیسلام و راگەیەرانی قورئانی پیرۆز بون لە دوای نائومید بونیان لە دژایەتیكردنی ئەم ئاینە بەئاشكرایی باشترین رێگایان بۆ بەرەنگاری كردنی ئەم ئیسلامە لەوەدا بینی كە ئەم جارە بە ناوی ئیسلامەوە دژایەتی لەگەڵ ئیسلامدا بكەن، جا بۆیە دەست درێژیان كردە سەر گەورەترین سەرچاوەی ئیسلام كە قورئانی پیرۆزەو بۆ ئەم مەبەستەش پێش هەمو شتێك دەستیان كرد بە دەمدرێژیكردن لەدژی ئەوانەی كە خزمەتكارو راگەیەنەرو كۆكەرەوەی قورئان بونوگیانو ماڵیان فیدا كردوە تا ئەم قورئانە وەكو هاتوە هەر بەوشێوەیە بە گەلانی پاش خۆیان راگەیەنن ، واتە هاوەڵانی پێغەمبەرمانﷺ جا ئەمانە دەستیان كرد بە بڵاو كردنەوەی ئەو فیكرە بۆگەنەی خۆیانو هاوەڵانی پێغەمبەریان كردە ئامانجو بەمونافق و فاسق و پاشگەزبونەوە ناویان دەزڕاندن كەبەم بۆچونە نەفامانەیان دوودڵیان خستە ناو ئومەتی ئیسلامەوە ئەوەتە كولەینی كەیەكێكە لەزانا گەورەكانی شیعە لە كتێبی "**الكا** "دا دەگێڕێتەوە كە گوایا ئەبو جەعفەری سادق وتویەتی: (**كان الناس أهلَ الردةِ بعد الن ﷺ إلا ثلاثة فقلتُ: وَمَن الثلاثة؟ فقال: ا قداد بن الأسود، وأبوذر، وسلمان الفارسي**...لەپاش فەوتی پێغەمبەر هەمو خەڵك پاشگەزبونەوە جگە لە سێ كەس، جاوتم: كێن ئەو سێ كەسە؟ وتی: میقدادی كوڕی ئەسوەدو ئەبوزەرو سەلمانی فارسی !) خۆ ئەگەرئەم قسەیە راستبێ هەربەم قسەیەی ئەوان (عەلی وفاتیمەو حەسەنو حوسەینیش) پاشگەز بونەتەوە! یان مەجلیسی كە یەكێكی ترە لە زانایانی شیعە لە كتێبی"**حق الیق** "دەگێڕێتەوە كە لەبارەی ئەبوبەكرو عومەرەوە پرسیاركرا لە عەلی كوڕی حوسەین كوڕی عەلی ئەویش لە وەڵامدا وتی:(**إنهُمَا كانا كافِرَين، الذي يُحِبُهُما فهو كافِرٌ أيضاً**/ بێگومان هەردووكیان كافرنو ئەو كەسەش كە ئەوانی خۆش بوێت ئەویش هەر كافرە)نازانم ئەگەر راست بێت عەلی باپیری چۆن بەوكافرانە رازی بوە و كچی خۆی بەعومەری كافرداوە؟! جا كەوابو ئەگەر ئەوقسەیەی ئەوان راست بێت ناكرێت متمانە بەم قورئانە بكرێت كە ئەمانە كۆیان كردوەتەوە،بەڵكو باوەڕیان وایە كە: (**إن القرآن الذي جاء به ج ائيل عليه السلام إ مد ﷺسبعة عشر ألف آية" ["الكا " للكلي كتاب فضل القرآن]**.ئەم قورئانەی كە جبرەئیل هێناویەتی بۆ محمد ﷺحەفدە هەزار ئایەتە)ئەمە لەحاڵێكدایە ئەم قورئانەی كە ئیستا لە بەردەست موسڵمانان دایە زۆركەمترە لە حەوت هەزار ئایەت،

بەم شێوەیە هەلێك درا بە دەست گاورو جولەكەكانەوە كە بڵێن هەر بە قسەی موسڵمانان خۆیان قورئانیش گۆڕانكاری تێدا كراوە ، بەڵام ئیبنوحەزم لەوەڵامیاندا دەڵێت:{**وأمّا قولُهم دَعوَى الروافِض تبديل القُرآن، فإن الروافض ليسُوا مِن المُسلم ،إ ا هي فِرقةٌ حَدَثَ أولها بعد موت رسول ا ﷺ بخمس وعشرينَ سنة... وهي طائفةٌ ري مَجرى اليَهودِ والنصارى الكِذبِ وَالكُفر**/الفصل ا لل والنحل/واتە: ئەمما پشت بەستنی مەسیحیەكان بە ئیدعای شیعەكان لە گۆڕانكاری لە قورئاندا، جا بە بێگومان كە رافزیەكان لە موسڵمانان نین، (تاكو بوترێت هەندێ لە موسڵمانانیش دەڵێن قورئان گۆڕانكاری تێدا كراوە..!) بەڵكو گەلێكن كە

بیستو پێنج سال پاش فەوتی پێغەمبەرﷺسەریان هەڵداوەو لە درۆو كوفردا هەربە رێی جولەكەو گاوردا دەڕۆن}.

بەڵێ راستە دین لە فاسقو كافر وەرناگیرێت ، جا كەسێك كە باوەڕی وابووبێت كە ئەصحاب فاسقو مورتەد بونەتەوە دەبێ باوەڕیشی بەم قورئانە نەبێت، وە بە پێچەوانەوە ئەوەی كە باوەڕی بەم قورئانە هەیە دەبێت باوەڕیشی وابێت كە ئەوانەی كە ئەم قورئانەیان كۆكردوتەوە پیاوانی صالحو جێی متمانەنو شیاوی ئەوەن كە دینیان لێوەربگیرێت جا هەر ئەمەش حەقو راستە وەك پەروەردگار لە وەسفی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ كە هەڵگرانی قورئان بون دەفەرموێ ﴿ وَكَّلْنَا بِهَا قَوْمًا لَّيْسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ /الأنعام: ٨٩/ جا بێگومان ئیمە ئەو قورئانە بە گەلێك دەسپێرین كە بێ باوەڕ نین بەو ﴾.

هەروەها كەسانێكیتركە دەیانزانی ئەگەر وەك ئه وانەی كە لەپێشدا باسمان كرد باس لە گۆڕینی قورئان بكەن ئەوا ئومەتی ئیسلامی پشتیان تێدەكاتو جێگاو پێگایەكیان دەست ناكەوێت ، جا بە شێوازێكیتر بۆ دژایەتی قورئان هاتنە مەیدانەوە ئەمانە هەمو هەوڵێكیان دەدا كەئایەتەكانی قورئان بەشێوەیەك باس بكەن كە لەگەڵ بیروبۆچونی ئەواندا بگونجێت ، جا كاتێك رەخنەیان لێدەگیرا كە چۆن قورئان بەوشێوازە مانا دەكەنەوە؟ دەیان گوت: ئەوەی تۆ باسی دەكەیت زاهیرو روبینی ئایەتەكەیە بەڵام ئەوەی كە ئێمە باسی دەكەین ناوەرۆكو حەقیقەتی ئایەتەكەیە وەك ئەوە لە مانای ئەم ئایەتەدا ﴿ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ /طه: ٢٤ ﴾ دەیانوت: مەبەست لە فیرعەون دڵی مرۆڤە واتە بگەڕێرەوە بۆلای دڵت كە ئەوە توشی سەركەشی بوە! یان لە ئایەتی ﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ / الرحمن:١٩ ﴾ مەبەست لە دوو دەریا عەلیو فاتیمەیە ، وە ﴿ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴾ مەبەست حەسەنو حوسەینە (بحار الانواربابی سیو شەشەم یەكەم ریوایەت).

جا جێی خۆیەتی كە بوترێت ئەگەر ئەو دوو دەریایە ﴿ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ /الرحمن:٢٠ ﴾ لەنێوانیاندا پەردەو بەربەست هەیە ﴾ جا حەسەنو حسین چۆن بەدنیا هاتون؟! بەڵێ ئەمانە توانیان بە گۆڕانكاری ئاوا لە ماناو مەبەستی ئایەتەكانی قورئان خەڵكێكی زۆر لە قورئانو بیروبۆچونی راست دوربخەنەوە جگە لەمانە هەندێكیش هەوڵیان داوە بە هۆی دڵ نەخۆشی یان باش تێنەگەیشتنیان لە قورئان بەرنگاری ئەو كتێبە پیرۆزە بكەنو شكو گومان بۆ باوەڕداران دروست بكەن، هەر لە سەردەمی دابەزینی قورئاندا ئەم رەخنەگرتنو خراپ تێگەیشتنانە هەبوە ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كە قورئان پێك هاتوە لەچوار بەش: بەشێكی هەموكەس لێی تێدەگات، بەشێكی ئەوانە لێی تێدەگەن كە شارەزایان چاكە لە زمانەوانی عەرەبیدا. بەشێكیتری ئەوانە لێی تێدەگەن كە خاوەنی عیلمو زانیاریەكی زۆرن كە پێیان دەوترێت " **الراسخون العلم** " وە بەشێكیشی عیلمەكەی تەنها لای پەروەردگارەو كەس وەك خۆی لێی تێناگات. كە ئەم بەشەیان تەنها باوەڕبون پێی پێویستە وموسڵمان هەرئەوەندەی لەسەرە.جارێك كەسێك باسی لەوە دەكرد كە لە قورئاندا شتانێك هەن كە پێچەوانەی یەكترن وەك ئەوەی كە لە شوێنێكدا هاتوە كە دەڵێت:﴿ لَآ أُقْسِمُ بِهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ﴾ كەواتە سوێند ناخۆم بەم شارەكە (مەكە) بەڵام لە شوێنێكی تردا دەڵێت: ﴿ وَهَٰذَا ٱلْبَلَدِ ٱلْأَمِينِ ﴾ واتە سوێند دەخوات بەشاری مەكە. بێ ئاگا لەوەی كە **"لا"** هەموكات لە زمانی عەرەبیدا مانای نەفیو رەد كردنەوەنادات تەنانەت هەندێ جار بۆ تەئكیدو جەختكردنەوە بەكاردێت وەك لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ:﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ /النساء:٦٥ ﴾

وە جاری واش هەیە كە زیادەیەو كاریگەری مانایی لەسەر رستەكەناكات.جا هەر بۆیە لە سورەتی واقیعەدا دەفەرموێ: ﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴾ كە مانای ئەوەنیە كە سوێند ناخۆم ئەوەتە لە درێژەی ئایەتەكە دا دەفەرموێ:﴿ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ /الواقعة: ٧٦/ بێگومان ئەگەربزانن ئەوە سوێندێكی گەورەیە ﴾ وەیان دەڵێن: لە ئایەتی پانزەی سورەتی یونس گۆڕانكاری لە قورئاندا رەت كراوەتەوەو ﴿ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ لِقَآءَنَا ٱئْتِ بِقُرْءَانٍ غَيْرِ هَٰذَآ أَوْ بَدِّلْهُ قُلْ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ

أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ ... /يونس:١٥ ﴾

بەڵام لە سورەتی نەحلدا باس لەوەدەکات کە گۆڕانکاری رویداوە: ﴿ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ ﴾

لەوەڵامدا دەڵێین: ئەم دوو ئایەتە نەك پێچەوانەی یەکترنین بەڵکو تەواوکەری یەکترن ئایەتی سورەتی یونس باس لەوە دەکات کە کافرەکان داوایان لە پێغەمبەرکرد کە ئەم قورئانە بگۆڕێت ،جا پێغەمبەریش پێی راگەیاندن کە ئەوە لەتوانای ئەودا نیە بەڵکو ئەو تەنها ئەو فەرمانانەی کە پێیکراوە رایدەگەیەنێت جا لە ئایەتی سورەتی نەحلدا رونی دەکاتەوە کە ئەوە ئیشی الله ی باڵادەستە کە کام ئایەت یان کام حوکمی بییەوێت دەیگۆڕێت جا باوەڕدار باوەڕی بە هەردوو ئایەتەکە هەیەو پێی وایە کە قورئان هەموی لەلایان پەروەردگارەوەیەو محمدیش ﷺدەسەڵاتی گۆڕانکاری تێدا نیە ،جا ئەمەچ دژایەتیەکی تێدا بو؟ وەیان یەکێکی تر کە پێیوابو شارەزای لەزمانی عەرەبی باشە دەی گوت: چۆن دروستە کە لە قورئاندا دەڵێت : ﴿ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ /ق: ٤٥ ﴾ بەڵکو دەبێت بیگوتایایە: نحن نعلم...!

ئەمانە هەروەك نمونە باس کران بەڵام هەمو رەخنەکان کە لە قورئان دەگیرێن لەبەر دوو هۆیە: رقو قینێکی زۆر بەرامبەر بە قورئان چونکە ناتوانن راستی ببینن‌و دان بە حەقیقەتدا بنێن یان جەهلو بەهەڵە تێگەیشتنە لە قورئان، بەڵێ زۆرن کەسانێك کە بە هۆی بێ ئاگاییان لە زمانی قورئان بەهەڵە لەمانای قورئان تێدەگەن ، جا هەم خۆیان حەقیان لێ ون دەبێت هەم رێ لە خەڵکیش ون دەکەن ، جا ناڵێن ئێمە تێنەگەیشتوین ، بەڵکو دەڵێن ئەوە قورئانە کە ئایەتەکانی پێچەوانەی یەکترن، هەندێکیش بەهۆی ئەو رقو قینەوە هەمو بنەمایەکی عیلمی‌و عەقڵی دەخەنە ژێر پێ‌و دەست لەسەر چاوی خۆیان دادەنێن تا حەق‌و حەقیقەت نەبینن جا ئەوەی کە خەوی لێ کەوتوە دەکرێت لە خەو دایچڵەکێنیت بەڵام ئەوەی کە بەدرۆ خۆی بەخەودا بردوە بەقیرەو هاواریش بە ئاگا نایەتەوە، جا ئەگەر بە دڵێکی پاك‌ولەسەر بناغەیەکی عیلمی‌و عەقڵی تەماشای قورئان بکرێت بەو پەری دڵنیایەوە دەڵێت: ﴿ لَّا يَأۡتِيهِ ٱلۡبَٰطِلُ مِنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَلَا مِنۡ خَلۡفِهِۦۖ تَنزِيلٞ مِّنۡ حَكِيمٍ حَمِيدٖ /فصلت:٤٢ ﴾

## دەست پێکردنی سورەتەکان:

شێوەکانی دەستپێکردنی سورەتەکانی قورئان دە شێوەیە،

یەکەم: دەستپێکردن بە سەناو مەدحی پەروەردگار کە ئەمانە دووبەشن، الف: ئەوانەی کە وەسفە چاکەکان بۆ پەروەردگار دەسلمێنن کە حەوت سورەتن کە پێنجیان بە ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ﴾ و دوویشیان بە ﴿ تَبَارَكَ ﴾ دەست پێدەکات.

ب: ئەو سورەتانەن کە بە تەسبیحاتی پەروەردگار دەست پێدەکات کە ئەوانیش هەرحەوت سورەتن کە بە موسەبیحات دەناسرێن.

دووهەم: ئەو سورەتانە کە بە بانگ کردن دەست پێدەکەن کە دە سورەتن کە سیانیان بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ وەسیانی تر بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾ دو سورەتیش بە﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴾وە سورەتی موزەمیلکەبە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُزَّمِّلُ﴾ هەروەها سورەتی مودەسیریش کە بە﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ ﴾ دەست پێدەکەن.

سێهەم: بیست‌و سێ سورەتن کە بە رستەی خەبەری دەست پێدەکەن کە ئەم سورەتانن: ئەنفال، تەوبە، نەحل، ئەنبیاء، مۆئمینون، نور، زومەر، محمد، فتح ، قەمەر، رەحمان، موجادەلە، حاقە، مەعاریج، نوح، قیامە، عەبەس، بەلەد، قەدر، بەینە، قاریعە، تەکاسور، کەوسەر.

چوارەم: ئەو سورەتانەن کە بە سوێند دەست پێدەکەن کە پانزە سورەتن کە ئەمانەن:﴿ وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴾ ﴿وَٱلذَّٰرِيَٰتِ ذَرۡوٗا ﴾ ﴿وَٱلطُّورِ ﴾ ﴿وَٱلنَّجۡمِ إِذَا هَوَىٰ ﴾ ﴿وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴾ ﴿وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرۡقٗا﴾ ﴿وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ﴾ ﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا ﴾ ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ ﴾ ﴿وَٱلضُّحَىٰ ﴾ ﴿وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ ﴾ ﴿وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا ﴾ ﴿وَٱلۡعَصۡرِ ﴾

پێنجەم : دەست پێکردن بە مەرج کە ئەمانەش حەوت سورەتن : واقیعە ، منافیقون، تەکویر، ئینفیتار، ئینشیقاق، زەلزەلەو نەسر.

شەشەم: ئەو سورەتانەن کە بە فەرماندان دەست پێدەکەن کە شەش سورەتن: سورەتی جن، عەلەق، کافیرون، ئیخلاص، فەلەق‌و ناس.

حەوتەم: پێنج سورەتیش بە پرسیار کردن دەست پێدەکەن کە ئەمانەن: سورەتی ئینسان، نەبە ء، غاشیە، فیلو ماعون.

هەشتەم: دەست پێکردن بە هۆ" التعلیل" کە تەنها سورەتی قورەیشە .

نۆهەم: ئەو سورەتانەی کە بە دوعا دەست پێدەکەن کە سورەتەکانی موتەففین‌و هومەزەو مەسەدە. دەهەم: ئەو سورەتانەن کە بە پیتە جیاکان (ا روف ا قطعة) دەست پێدەکەن کە ئەمانە بیست‌و نۆ سورەتن: بەقەرە، ئالی عیمران، ئەعراف، یونس، هود، یوسف، رەعد، ئیبراهیم، حیجر، مریەم، تاها، شوعەرا، نەمل، قەصەص، عەنکەبوت، روم، لقمان، سەجدە، یاسین، صاد، غافیر، فوصیلەت، شورا، زخرف، دوخان، جاسیە، ئەحقاف، قاف‌و قەلەم، وتراوە ئەم سورەتانە کە بەم پیتانە دەست پێدەکەن هەموویان مەکین جگەلە سورەتی بەقەرەو ئالی عیمران کە ئەمە یەکێکە لەو رێگایانەی کە سورەتەکانی مەکی‌و مەدینەیی پێ لەیەکتر جیا دەکرێنەوە.

### مەکی‌و مەدینەیی سورەتەکان:

ماوەی هاتنە خوارەوەی قورئان بیست‌و سێ ساڵ بوە کە بەهۆی کۆچی پێغەمبەرەوەﷺ بۆ مەدینەو دامەزراندنی حکومەتەوە سورەتەکانی قورئان بە مەکەیی‌و مەدینەیی ناوبراون جا ئەوەی کە بەر لە کۆچی پێغەمبەرﷺ دابەزیوە بە مەکەیی دەناسرێت‌و ئەوەش کەپاش کۆچی دابەزیوە بەمەدینەیی دەناسرێت ئیتر لەهەرکوێدا دابەزیبن.واتە ئەوەی کە رەچاو دەکرێت کاتە نە شوێنی دابەزینەکە، ئەو سورەتانەی کە مەکین کە زۆرتر باس لە بنەماکانی ئیسلام دەکەن‌و شێوازەکانیان زۆر بتەوو توندە چونکە رولە بێ باوەڕانی مەکە دەکات کە دژایەتی قورئان‌و پێغەمبەریان ﷺدەکرد زۆربەی ئەم سورەتانە ئایەتەکانیان کورتە بەڵام سورەتە مەدینەییەکان کە زۆرتر باس لە ئەحکامەکان دەکەن‌و بەرامبەرەکەی باوەڕدارانن شێوازێکی ئارام‌و هێواشیان هەیەو ئایەتەکانیان درێژە،

بۆ ناسینەوەی ئەم دووبەشە لە یەکتری زانایان چەند شتێکیان داناوە، لەوانە هەرسورەتێك وشەی "كَلَّا" ی تێدابێت ئەوە مەکییە ئەم وشەیە سی‌و سێ جار لە پانزە سورەتی قورئاندا هاتوە ، وەیان هەرسورەتێك کە سوجدەی تێدایە وە یان هەرسورەتێك کە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ ی تێدا بێت بەو مەرجەی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ ی تێدا نەبێت ئەوە مەکیە بەڵام سورەتی حەج کەهەم ئەم هەردوو وشەو هەم سوجدەی تێدایە زانایان لەسەر مەکەیی بون یان مەدینەیی بونی یەکدەنگ نین. وەبێجگە لە سورەتی بەقەرە هەرسورەتێك باسی ئادەم‌و ئیبلیس یان باسی گەلانی پێشوی تێدا هاتبێ یان هەر سورەتێك بە پیتە جیاجیاکان دەستی پێکردبێت جگە لە بەقەرەو ئالی عیمران ئەوە مەکیە. وە هەر سورەتێك کە فەرز یان حەدێکی تێدا پێویست کرابێ ئەو سورەتە مەدینەییە وەجگە لە سورەتی عەنکەبوت هەرسورەتێك کەباسی موناففقەکانی تێدا هاتبێ یان هەر سورەتێك کە بە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ دەست پێدەکات ئەوە مەدینەییە. هەندێ لە زانایان وتویانەهەندێ سورەت دووجار دابەزیوە جارێك لەمەدینەو جارێکیش لەمەکە و هەندێکیش وتویانە لەسورەتە مەکەییەکان هەیە کەچەند ئایەتی لەمەدینەدا دابەزیوە وەك لە سورەتی حەج‌وجگە لەوێشدا هاتوە.

ناسینی مەکی و مەدەنی سورەتەکان هۆکارێکی گرنگن بۆ تێگەیشتنی ئایەتەکان‌و ناسینی ناسخ‌و مەنسوخی قورئان.سورەتە مەکیەکان هەشتاودوو سورەتن کە ئەمانەن:

**الأنعام، الأعراف، يونس، هود، يوسف، إبراهيم ، ا جر، النحل، الإسراء، الكهف، مر ،طه، الأنبياء، ا ج، ا ؤمنون، الفرقان، الشعراء، النمل، القصص، العنكبوت، الروم،لقمان، السجدة، سبأ، فاطر، يس، الصافات، ص، الزمر ، غافر، فصلت، الشورى، الزخرف،الدخان، ا اثية، الأحقاف، ق، الذاريات، الطور، النجم، القمر، الواقعة، ا لك،القلم، ا اقة، ا عارج، نوح، ا ن، ا زمل، ا دثر، القيامة، الإنسان، ا رسلات،النبأ، النازعات، عبس، التكوير، الانفطار، الانشقاق، ا وج، الطارق، الأعلى،الغاشية، الفجر، البلد، الشمس، الليل، الضحى، الانشراح، التا ، العلق، العاديات،القارعة، التكاثر، العصر، ا مزة، الفيل، قريش، ا اعون، الكوثر، الكافرون، وا سد.**

سورەتە مەدەنیەکانیش بیست سورەتن کەئەمانەن:

**البقرة، آل عمران، النساء، ا ائدة، الأنفال، التوبة، النور، الأحزاب، مد، الفتح، ا جرات،ا ديد، ا ادلة، ا شر، ا متحنة، ا معة، ا نافقون، الطلاق، التحر ،والنصر**

وە ئەوە سورەتانەش کە لە سەر مەکی یان مەدەنی بونیان ناکۆکی هەیە دوانزە سورەتن کە ئەم سورەتانەن: **الفا ة، الرعد، الر ن، الصف، التغابن، ا طفف ، القدر، البينة، الزلزلة،الإخلاص، الفلق، والناس**

## ناسخ ومەنسوخ:

قورئان لەسەردەمێکدا دابەزی کە خەڵك لەوپەڕی سەرلێشێواویو بێ ئاگاییدا بونو هیچیان لەبارەی ئیسلامەوە نەدەزانی و هەمو رەوشتێکی ناڕەوا لەناو کۆمەڵگادا وەك گیا کەڵە بنجی داکوتابوو کەدژایەتی کردنی زۆر دژواربوو، جاخوای داناوزانا پێغەمبەری رەوانەکرد بۆ ریشە کێش کردنی ئەو هەمو رەوشتە نالەبارو پیسانەودانانی رەوشتی جوان لەجێگاکاندا جا چونکە هەندێ لەو رەوشتانە ئەوەندە پیسو نابەجێ بون نەدەکرا هیچ جۆرە چاو پۆشییەکیان لێ بکرێت بەڵکو ئیسلام بەبێ چاوپۆشی لێ کردن راستەوخۆ لەدژیان وەستاو هەمو کونو کەلەبەرێکی لێ داخستن وەك بت پەرستی و داوێن پیسی ودرۆو دزی کە دەقەکان یەکسەر دابەزینە سەریان و هیچ ماوەیەکیان پێ نەدان، جا دەقەکان هەرچۆن دابەزین هەربەوشێوەیەش مانەوە، بەڵام هەندێکی تر لەو رەوشتە ناپەسەندانە زۆرجێگای خۆیان کردبویەوە لەدڵو دەرونی زۆربەی خەڵکداو پەلاماردانی یەکسەرەیی زیانی لەسودی زۆرتر دەبو بۆ کۆمەڵگا لەبەر ئەوە ئیسلام قۆناخ بەقۆناخ هەوڵی لەناوبردنی داوەو دەقی سەردەمی کۆنی جیاوازە لەگەل دەقی قۆناخی پاش خۆی، جا لێرەدا زۆربەی زانایان پێیان وایە کە دەقی قۆناخی پاشی ناسیخ و هەڵوەشێنەرەوەی قۆناخی پێش خۆیەتی ،

وشەی "النسخ" واتە لەناوبردن یان گۆرانکاری یان سڕینەوە کە مەبەست پێی، {**رَفعُ حُکم شرعي سابق بدليل شرعي لاحق**} واتە: لابردنی بڕیارێکی شەرعی پێشو بەهۆی بڕیارێکی شەرعی کە دواتردابەزیوە، بەو لابردنو هەڵوەشاندنەوە دەڵێن نەسخو بەو حوکمەی کە لابراوە دەڵێن مەنسوخو ئەوبەڵگەیش کە لایبردوە پێیدەوترێت ناسخ، جا پێویستە ئەوەش بزانین کە:

الف: لە بیرو باوەڕوهەواڵوداستانەکان دا هیچ جۆرە نەسخێك نیە بەڵکو نەسخ تەنها لەکردارە فەرعیەکاندایە.

ب: نەسخ لەبڕیارێکدا دەبێت کە دەقەکان لەدژی یەك بوەستن وهیچ رێگایەکیش نەبێت بۆ یەکخستنیانو دەقە هەڵوەشێنەرەوەکە پاش دەقە هەڵوەشێنراوەکە دابەزی بێت واتە دەبێ مێژوی هاتنی دەقەکان زانراوبێتو هیچ رێگایەکیش نەبێت بۆیەکخستنیان ئینجا رودەکرێتە نەسخ.من پێم وایە نەسخ بەوشێوە فرەوانەی کە هەندێك وتویانە زۆرە لەجێگای خۆیدا نیەو ئینکاری کردنیشیم پێ بێ جێیە، پێویستە ئەوەش رەچاو بکرێت کە هەندێ لە زانایان وشەی نەسخیان بۆ " **التخصيص**"وە یان بۆ " **الاستثناء**"ش بەکارهێناوە.لێرەدا نمونەیك لەسەر نەسخ باس دەکەین، بۆنمونە: عارەق خواردنەوە کە لەو سەردەمەدا وەك ساردی ئەمڕۆ بەکار دەهێنرا ئەوە بوئیسلام لەبەر زیانەکانی لەموسڵمانانی قەدەغە کرد بەڵام بە چەند قۆناغێك، هەروەك چۆن بەندایەتیەکانی بەهێواشیو قۆناخ بەقۆناخ لەسەر موسڵمانان پێویست کرد تا ئەو جیلە رێكو پێکە دروستبو کە الله کردنی بەمامۆستاو رێ پیشاندەرو سەرپەرشتی خەڵکی، خوای گەورە کەبڕیاری لەسەر قەدەغەکردنی عارەق بو سەرەتا مادەی سرکەری لەرۆزی جوان جیا کردەوە وەك دەفەرموێ:

﴿ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلۡأَعۡنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنۡهُ سَكَرٗا وَرِزۡقًا حَسَنًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ /النحل: ٦٧ / وەلە بەروبومی خورماو ترێ کان ئێوە ماددەی سەرخۆشی و رۆزییەکی شیرینو جوان وەردەگەرن ، بێگومان لە تەماشاکردنی ئەو هەمو نیعمەتە جۆراو جۆرانەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ ئەو گەلەی کە ژیری خۆی بخاتەکارەوەو چاك بیر بکاتەوە﴾

ئەمە یەکەم ئایەت بوو کە هاتە خوارەوەو خراپی مادەی سەرخۆشکەری لێ وەرئەگیرا ، چونکە خوا جیای کردوەتەوە لە رۆزی جوان، جا ئەوانەی ئەمەیان وەرگرت هەندێکیان وازیان لە خواردنەوەی شەراب هێناو هەندێکی تری داوای لە خواکرد کە جوانتر بۆیان رۆشن بکاتەوە کەبەمە دوودڵی دروستکرد لەلای ئەو باوەڕدارانەش کە هێشتا هەر دەیانخواردەوە، ئینجا تێیگەیاندن کەتاوانی زۆرترە لەسودی فەرموێ:﴿پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی ئارەق و قومارەوە

بڵێ: لەم دوانەدا گوناهێکی گەورە هەیەو سوودیشی هەیە بۆ خەڵك بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە سوودەکەیان ﴾ ،

بەمەش هەندێ لە موسڵمانان وازیان هێنا بەڵام پاش ماوەیەکیتر ئایەت دابەزی کە ﴿ نزیکی نوێژ نەکەونەوە کاتێ کە سەرخۆشن﴾ ئاشکرایە نوێژ واجبەو ناتوانن وازی لێ بهێنن دەی ئیتر کاتیان کەم بویە ، وە ئەمە بوو بە هۆی ئەوەی کە هەندێکیان بۆ هەمیشە وازی لێ بهێنن ئەوانیتریش رابێن لە سەر بەرگریکردنی خۆیان لە خواردنەوەی عارەق ، ئینجا لە ساڵی شەشەمی کوچیدا واتە پاش نۆزدە ساڵ لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ /المائدة: ٩٠/ ئەی باوەڕداران ئارەق‌و قومارو بت پەرستی‌وئەنجامدانی کاربەهۆی ئەو بۆچونە تایبەتیەوە بەهەڵدانی تیرەکان پیسییەکن لە کاروکردارە پیسەکانی شەیتان سا وازی لێ بهێنن بەڵکورزگار ببن﴾ جا بەم شێوەیە بەچەند قۆناغ پەوەردگار عارەق‌و قوماری لەسەر حرام کردن ئەمەش حیکمەت‌ولوتف‌و بەزەیی ئەو زاتە میهرەبانە پیشان دەدات، وە هەندێك لە زانایان وتویانە کە یەکەم شت کە نەسخی بە سەردا هاتوە رو کردن بەرەوە "بیت المقدس" بوە کە لە ئایەتەکانی سورەتی بەقەرەدا باسی لێکراوە.

## ا كم وا نشابه:

محكم واتە: بتەووریك‌وپێك‌وبێگەردو چەسپاو بەیەکەوە، کە ئەم قورئانە هەموی وایە وەك دەفەرموێ:﴿ الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ /هود: ١ /الف لام. را ئەم قورئانە پەڕاوێکە مەحکەم کراوە ئایەتەکانی‌و رێك وپێکن‌وبە شێوەیەکی چاك و رەوان بێژراوو داڕێژراون لەپاشان درێژەی پێدراوەو رۆشن کراوەتەوە لەلایەن کەسێکەوە کە کار بە جێ و زۆر بەئاگاو لێ زانە﴾

موتشابە: واتە: لەیەکچو کە دیسان ئەم قورئانە هەموی وایەو لەیەك دەچێت وەك دەفەرموێ: [ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ /زمر:٢٣/ زاتی (الله) جوانترین قسەی ناردوە کە پەڕاوێکەو سورەتەکانی لەیەك دەچن‌و دووبارەکراوەیەو بە خوێندنەوەی پێستی لەشی ئەو کەسانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن موچرکەی پێدادێت پاشان پێستیان و دڵیان نەرم ئەبێت بۆیادی (الله) ئەمەیە رێنمای (الله) بۆ هەرکەسێك کە ئارەزۆی لێ بێت رێنمایی دەکات‌و هەرکەسێکیش کە (الله) رێگای لێ ون بکات، ئیتر هیچ کەسێکی تر نیە کە رێنمایی بکات ﴾. قورئان بەشێکی فرمانەکانی ئاشکرایەو ماناکەی دەفامرێت کە بە (محکم) ناودەبرێت کە پەیڕەوی کردنی ئەرکی سەرشانی باوەڕدارانەو لێکۆڵینەوەو وردبونەوە لێی ئیشێکی پەسەندەو رەوایە بەڵام بەشێکی تری ماناو مەبەستی نازانرێت‌و پێویستە زانینەکەی حەواڵەی الله بکرێت و هەر ئەوەندەش لەسەر باوەڕداران پێویستە کە پێی دەوترێت (متشابە) کەمەبەستی ئەم ئایەتەش ئەوەیە کە دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنْهُ ٱبْتِغَآءَ ٱلْفِتْنَةِ وَٱبْتِغَآءَ تَأْوِيلِهِۦ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ /آل عمران:٧/ خوا ئەو زاتەیە کەئەم کتێبەی بۆ تۆ رەوانە کردوە ئەی محمد ﷺکە لەو کتێبە دا چەندەها ئایەتی موحکەم هەیە کە حوکمیان دەزانرێت‌و ئیشیان پێ دەکرێت‌و ماناکەیان زۆر رۆشن و ئاشکرایە کەئەوانە ئەسڵی کتێبەکەن‌و ئەو کتێبە بۆ ئەو مەبەستە رەوانە کراوە، وە هەندێکی تری ئاڵۆزەو لەیەك دەچن‌و چەندین مانا هەڵدەگرێت. جائەوانەی کە نەخۆشی لە ناو دڵیان دایە دوای ئەوانە دەکەون کە مانایان رۆشن نیە ، ئەوسا نەك بۆ ئەوەی ڕاستی بزانن بەڵکو بە مەبەستی ئاشۆب دروستکردن و بە مەبەستی مانای نارێك ، خۆ مافیان نەبو کەئەو رێگا هەڵیە بگرنە بەر ، چونکە کەس مانای ئەو موتەشابیهانە نازانێت بێجگە لە خوای گەورە خۆی، وە ئەوانەی کەوا زۆر چونەتە خوارەوە لە عیلما و شارەزاییان لە تەوحید و یەکتا پەرەستی دا زۆرە دەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەو ئایەتانە هەیە

و له لایەن خوای خۆمانەوە هاتوە و بێگومانیش سودێکی زۆری تێدایە بەڵام ئێمە دەرکی پێ ناکەین، جابیر ناکاتەوە لەم راستیانە مەگەر ئەوانەی کە خاوەنی ژیرین . واتە تەنها خاوەن عەقڵەکان لەمە بیر دەکەنەوەو سودی لێ وەردەگرن﴾ لەهەمان سورەتدا ئەم سێ بەشە باسکراون. واتە بە کورتی قورئان هەموی محکمەو هەموی متشابەوهەندێکی محکمەو بەشێکی متشابە بەو مانایانە کە باسمان کرد.

## سەرەتاو کۆتایی قورئان:

یەکەم شت کە لە قورئان دابەزیوە سەرەتای سورەتی عەلەقە، کاتێك کە پێغەمبەرﷺ گەیشتە تەمەنی چل ساڵی شەوێك لە ئەشکەوتی حیرا فریشتەیەك هاتەلای و وتی: بخوێنە،پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: منیش وتم : من خوێندەوار نیم، ئینجا فەرموی: گرتمیو وشاردمی بەخۆیەوە هەتا زۆر نارەحەت بوم، لەپاشان دەستی لێ کردمەوەو وتی: بخوێنە، وتم: من خوێندەوار نیم .هەم بەتوندی گوشیمی بەخۆیەوەو ئێشم پێ گەیشت پاشان وازی لێهێنامو وتی: بخوێنە منیش وتم: خوێندەوار نیم جا جاری سێهەم گوشیمی بەخۆیەوە تا زۆر نارەحەت بوم ئینجا بەری دامو وتی: [ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ]هەتا طەیشتە [عَلَّمَ ٱلْإِنسَٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ]. بەڵام سەبارت بە ئاخرین ئایەت یان سورەت کە دابەزیوە فەرمودەیەکی راستمان لە پێغەمبەرەوەﷺ نییە بە لام هەندێ لە یارانی بە پێی ئیجتهادی خۆیان و ئاگاداریان لە ئاخرین ئایەت یان سورەتێك کە بیستویانە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لەوبارەوە قسەیان کردوە، بەرائی کوڕی عازیب دەڵێت:{**آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ بَرَاءَةٌ وآخِرُآيَةٍ نَزَلَتْ يَسْتَفْتُونَكَ قُلْ اللهُ يُفْتِيكُمْ فِي الكَلالَةِ/متفق عليه/** دواترین سورەت کەدابەزیوە بەرائەتەو دواترین ئایەت کەدابەزیوە ئایەتی کەلالەیە} وە ئیبنو عەباس دەڵێت:{**آخِرُ آيةٍ نَزَلَتْ عَلَى النبي ﷺ آيةُ الرِبَا //البخاري/** دواترین ئایەت کە دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرﷺ ئایەتی ریبایە) مەبەست بە ئایەتی ریبا ئایەتانی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَذَرُوا۟ مَا بَقِىَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾ ﴾ و ئایەتی﴿ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾ ﴾ کە هەر دوو لە سورەتی بەقەرەدایە جا هەر بۆیە لە ئیبنوعەباسەوە هاتوە کە ئایەتی ﴿ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ ۖ ﴾ بەئاخرین ئایەتی ناوبردوە(**أخرجه النسائي**)وە لە روایەتەکەی ئیمامی مسلم دا هاتوە کە پرسیارکرا لە ئیبنو عەباس: **أَتَدْرِي آخِرَسُورَةٍ نَزَلَتْ مِنْ القُرْآن نَزَلَتْ جَمِيعًا قُلتُ: نَعَمْ إذَا جَاءَ نَصْرُاللهِ وَالفَتْحُ/** ئایادەزانی کام سورەت دواترین سورەتەکە هەموی پێکەوەدابەزی بێت؟ وتم: بەڵێ ﴿**إذَاجَاءَنَصْرُاللهِ وَالفَتْحُ** ... ﴾

بەڵێ بەکۆچی دوای پێغەمبەرﷺدابەزینی وەحیو دانانی یاساو تەشریع کۆتای پێهات چونکە پەروەردگار دوایین پێغەمبەری ﷺ خۆی نەبردەوە تا ئەو ئاینەی کە خۆی رازیە بۆ بەندەکانی تەواوی کردو هیچ کەم کوڕییەکی تێدا نەهێڵا هەروەك دەفەرموێ:﴿ ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِى وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۚ /المائدة: ٣ ﴾

بەلام لەم بارەوەش لەدوای کۆچی پێغەمبەرﷺ کەسانێك هاتن کە ئیدعای پێغەمبەرایەتیو دابەزینی وەحیان دەکرد کە یەکێك لەوانە موسەیلەمە بو کە موسڵمانان لە سەردەمی ئیمامی ئەبوبەکردا لەناویان برد.

پاشان کەسانێکی تر هاتن کە باوەڕیان وابوکە لەدوای پێغەمبەرﷺ دوانزە کەس کە لە بنەماڵەی پێغەمبەرنو پلەوپایەیان لە پێغەمبەران بەرزترە بە بەردەوامی وەحییان بۆ دادەبەزێ؟! کە ئەمانە بەشیعەی دوانزە ئیمامی دەناسرێن فەرمودە گەلێك دەدەنە پاڵی ئەم دوانزەکەسە ئینجا دەڵێن چونکە وەحیان بۆ هاتوە هەمو قسەکانیان بەلگەنو ئەوەی کە وتویانە حەلاڵە حەلاڵەو ئەوەی کەوتویانە حەرامە حەرامە، دواتر کەسانێکی تر وەك قادیانیەکان پەیدا بون کە باوەڕیان وایە کە میرزا غولام ئەحمەد پێغەمبەرێکە کە وەحی بۆ دابەزیوە ئەمانە باوەڕیان وایە پێغەمبەران دووبەشن: بەشێك کە یاساو تەشریعی تایبەتیان پێیەو پێویست کراوە کەرایگەنن بەشێکی تر تەنها راگەیاندیان لەسەرەو خاوەنی یاساو ئاینێکی تایبەت نین، جا بەشی یەکەمیان بەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام کۆتای پێهاتوەو کەس ناتوانێت شتێك حەلاڵ یان حەرام بکات بەلام بەشی دووهەم کۆتای پێنەهاتوەو میرزا غولام ئەحمەد یەکێك لەوانەیە، ئەم بۆچونە ئەگەرچی کوفرەو گومڕاهیە بەلام هێشتا لەخراپیدا ناگاتە بۆچونی شیعە دوانزە ئیمامییەکان چونکە ئەوان نەپێیان وایە کە غولام ئەحمەد لە

پێغەمبەرانی پێشو بەرزترەو نە خاوەنی تەشریعو یاسایەکی تایبەتە بەڵام جیاوازی ئەوەی کە شیعەکان لەباتی وشەی پێغەمبەر وشەی ئیمام بەکاردەهێنن ئەگەرچی ئیمامیش لە لای ئەوان لە پێغەمبەرایەتی بەرزترە بەڵام قادیانیەکان وشەی "النـ " واتە: پێغەمبەر بۆ غوڵام ئەحمەد بەکار دەهێنن ، بەڵام باوەڕی راستەقینە هەر ئەوەیە کە پێغەمبەرمان بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێ: {وَإِنَّهُ سَيَكُونُ فِي أُمتِي كَذابُونَ ثَلَاثُونَ كُلُهُمْ يَزْعُمُ أَنَّهُ نَبِي وَأَنَاخَاتَمُ النبِيِ لَانَبِي بَعْدِي/ ابوداود، صحه الألبا / بێگومان بەم زوانە لەناوئومەتی مندا سی درۆزن پەیدا دەبن کەهەمویان واگومان دەکەن کە پێغەمبەرن لەحاڵێکدا کەمن دواترینی پێغەمبەرانمو هیچ پێغەمبەرێکیش لەپاش من نیە}.

## کێشمەکێش لەقورئان دا

پێغەمبەرمان دەفەرموێ:{الْمِرَاءُ فِي الْقُرْآنِ كُفْرٌ / أ د، أبوداود، صحه الألبا / دەمبازیو کێشمەکێش کردن لەبارەی قورئانەوە کوفرە}

چونکە دەمبازی لەبارەی قورئانو بەگژی یەکدانی ئایەتەکانی بەڵگەن لەسەر رێز نەگرتنی قورئان جا ئەوەیش کە رێز لە قورئان نەگرێت ئەوە کافرە.کەواتە لەسەر باوەڕدار پێویستە کەبەم فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ کاربکات کە دەفەرموێ: {اقْرَءُوا الْقُرْآنَ مَاائْتَلَفَتْ قُلُوبُكُمْ فَإِذَا اخْتَلَفْتُمْ فَقُومُوا عَنْهُ/ متفق علیه/هەتا ئەوکاتەی کەدڵە کانتان بەیەکەوە گرێ دەخۆن قورئان بخوێنن ئەوسا هەرکاتێ ناڕێك بون هەستنو وازی لێ بهێنن}

بەراستی ئەم فەرمودە بەرێزە چەند ئەصڵو بناغەیەکی گەورەمان پێشاندەدات،

یەکەم: خوێندنەوی قورئانو لێکوڵنەوەی دەبێت هۆکارێك بێت بۆ نزیك بونەوەی دڵی باوەڕدان لەیەکتری.

دووهەم: هەر قسە یان کۆڕێك کە ناکۆکی لە نێوان باوەڕداراندا دروست بکات پێویستە وازی لێ بهێنرێت با زۆر گرنگیش بێت چونکە لە مەجلیسی خوێندنەوەی قورئان پیروزترنیە!

عەبدوڵای کوڕی عەمر دەڵێت: چەند کەسێك لە پێش دەرگای پێغەمبەر ﷺ دانیشتبونو لەسەر قەزاو قەدەر بو بە دەمەقاڵەیان جا هەندێکیان وتیان: مەگەر ئەو ئایەتە ئاواو ئاوا نالێت، هەندێکتریشان وتیان: ئەی مەگەر ئەو ئایەتە ئاوا نالێت، واتە: هەرکام ئایەتانێکیان دەکرد بە بەڵگە بۆ راستی بۆچونەکەیان جا پێغەمبەر ﷺ کە ئەمەی بیست هاتەدەرەوەو سور بویەوە وەك ئەوەی کە دانەی هەنار بە روخساریداتەقێنرابێت ، جا فەرموی: {بِهَذَا أُمِرْتُمْ أَوْبِهَذَا بُعِثْتُمْ أَنْ تَضْرِبُوا كِتَابَ اللهِ بَعْضَهُ بِبَعْضٍ إِنَمَاضَلتْ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ فِي مِثْلِ هَذَاإِنكُمْ لَسْتُمْ مِماهَاهُنَافِي شَيْءٍانْظُرُوا الذِي أُمِرْتُمْ بِهِ فَاعْمَلُوابِهِ وَالذِينُ هِي تُمْعَنُهُ فَانْتَهُوا /أ د، حسنه الألبا / بەمەفەرمانتان پێدراوە یان بەمە رەوانەکراون کە پەیامەکەی خوا هەندێکی بکەن بەگژی هەندێکدا؟! گەلانی پێش ئێوە هەر لەسەر شتی وا گومڕابوون، ئێوە ئالەمبارەوە هیچتان پێ نەسپێر راوە، تەماشابکەن ئەوەی کە فەرمانتان پێکراوە بیکەنو ئەوەی کە بەرگری لێ کراون وازی لێ بهێنن}

واتە قورئان بۆ عیلمو عەمەل دابەزیوە وەك لە ئیبنو مەسعود دەگەڕێنەوە کەدەیوت: {كنا نتعلمُ من رسول ا ﷺ العَشرَ فلا نُجَاوِزُهَا إ العَشْرِ الْأخَرِ ح نعلمَ ما فيهَا مِنَ العلمِ والعملِ/زاد ا س علم التفس للإمام ابن ا وزي/ ئێمە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ فێری دە ئایەت دەبوین و نەدەچوین بۆ دە ئایەتی تر هەتا هەمو زانیاریو کردارێکی ناو ئەودەئایەتە فێر دەبوین}.

جا ئەوەبوکە تام و چێژێکی گەورەیان لە قورئان دەکرد وەك لە عوسمانی کوڕی عەفانەوە دەگێڕنەوە کە دەیوت: {لو أن قلوبَنا طَهُرَتْ ما شَبِعْنَا من كلامِ ربنا ، و إ لأكرهُ أن يأ َ علي يومٌ لا أنظرُ ا صحفِ/ ئەگەر دڵمان پاك بوایە تێر نەدەبوین لەفەرمودەی پەروەردگارمان، بێگومان پێم ناخۆشە کە رۆژێك بەسەرما تێ پەڕێتو تەماشای قورئان نەکەم}

## لەبەرکردنی قورئان:

پێغەمبەرمان دەفەرموێ:{يُقَالُ لِصَاحِبِ الْقُرْآنِ اقْرَأْوَارْتَقِ وَرَتلْ كَمَاكُنْتَ تُرَتلُ فِي الدنْيَافَإِن مَنْزِلَتكَ عِنْدَآخِرِآيَةٍتَقْرَأُبِهَا/ ابوداود، صحه الألبا /ئەوەی کە قورئانی لە بەرکردوە پێی دەوترێت بخوینەرەوەو سەرکەوە، بیخوێنەوە وەك چۆن لەدنیادا دەتخوێندەوە ،جا بەراستی شوێنو مەقامی تۆ لای ئاخرین ئایەتێکە کە دەیخوێنیتەوە}.

جا هەرچی زۆرتری لەبەربێت مەقامی بەرزترە بەڵام دەبێت ئەوەش بزانرێت کە بەو مەرجەی ئەو لەبەرکردنەی قورئان هەرمەبەست خوداو پاداشتی دوارۆژبێتو بۆ ریاو مەبەستی دنیایی نەبێت ، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{أَكْثَرُ مُنَافِقِي أُمتِي قُرَاؤُهَا / أ د، صحه الألبا / زۆرترینی مونافقی ئومەتم قورئان خوێنەکانیەتی } قورئان خوێنەکان ئەمەفەرمودەیەکی راستەو دەخیلە ئاگاتان لە خۆبێت.

تێبینی:

**الف**: ئەگەرچی ناومان ناوە( تەفسیری تەوحید) بەراستی من ئیدعای تەفسیری قورئان ناکەم، بەڵکو یەژم ئەمە گرڕوگاڵێکی منە لەژێر سێبەری قورئانداو هەڵمژینی بۆنێکی خۆشە لە فرمایشتەکانی پەروەردگاری میهرەبان‌و ئاواتێکی دەرونی مناڵیم بو پەروەردگارم لێی بە زیادبێ بۆی هێنامە دی، لەراستیدا هەرلە مناڵیم دا لەتەمەنی حەوت ساڵیدا حەزم لەقورئان‌وفام کردنی بو هەر لەسەر ئەوەش زللەیەکی باشم خواردو گریانێکی باشیشم کرد، بەڵام هەرچەند بەهەتیوی‌و کەم دەستی لەگەڵ دایکم‌و خوشکێکی لەخۆم بچوکتردا بەسەختی ژیانمان بەڕێ دەکردو پاشان سەرهەڵدانی شۆڕشی کوردی‌و شەڕی نالەباری حکومەتی عێراق‌و هێرشی تەیارەو تۆپخانەو قەدەغەبونەکانی گەڕان لە شاری هەڵبجەو دەیان گرفت‌و مەینەتی تر سوپاس بۆ الله توانیم خوێندنی مەدرەسەی دینی‌و مەعهەدی ئیسلامی‌و خوێندنی حوجرەم لە ساڵی (هەزارو نۆسەدو حەفتاودوی زاینی) تەواوبکەم، ئیتر پاش ئەوە ئەوەندە دەردەسەری‌و قولای قول‌و ئاوارەیی ئەملا بۆ ئەولا هەتا نوسینی ئەم چەند دێڕە منی لاوەرانی‌و ئیمامی نازانم بڵێم خەڵکی کوێم؟! إنالله وإنا إليه راجعون .

**ب**: لەپاش مانای هەموئایەتێکەوە نوختەیەکمان(.) داناوە بەڵام لەهەندێ ئایەتدا لەبەر پەیوەندی زۆر توندیان بەیەکەوە لەگەڵ ئایەتی پاش خۆی واوێکی هەڵەوگەڕاوی (،) بچوکمان داناوە،

لەهەندێ جاریشدا بۆڕۆشنکردنەوەی مانای ئایەتەکە وشەگەلێکمان تێکەڵاو بەماناکەی کردوە ئەو دوو کارەمان بۆ نەکراوە.

**ج**: تائەوجێگایە کەکراوە مانای ئایەتەکانمان وشاردوە بەیەکەوە.

لە کۆتاییدا سوپاس‌و رێزم هەیە بۆ تەواوی ئەو براو خوشکانەی کە لە کۆکردنەوەو لەنوسین‌و رێکوپێك کردنی ئەم خزمەت بە( قورئانە) دا دەستیان بوە بەتایبەت برای زیادە خۆشەویستم کاك حاجی عبدالله کە هۆی سەرەکی ئەم دەرسانەی تەفسیر بو، جا پاشانیش ئەرکی خستنە سەر کاغەزیشی گرت ئەستۆی خۆیەوەو زەحمەتێکی زۆری کێشا وبەچاکی ئیشی خۆی بردە سەر پەروەردگار پاداشتی خێری بداتەوە وخۆی ماڵومناڵی لە فیردەوسی ئەعلادا جێ بکاتەوە، دەسا ئەی پەروەردگارم هەمومان لەوێدا کۆ بکەرەوە، ئامین.

اللهم إني أَسْأَلُكَ بِكُل اسْمٍ هُوَ لَكَ ، سَمّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ ، أَوْ أَنزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أو اسْتأثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيبِ عِنْدَكَ، أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي ، وَنورَ صَدْري ، وَجِلاءَ حُزْنِي ، وَذَهَابَ هَمي

واجْعَل الْقُرْآنَ حُجةً لي وَ لا عَلَي اللهم اجْعَل خَ عُمري

آخِره وَخَ عَمَلي خَواتِمه وخَ أيامي يَوم ألقاك فِيه

وصَل اللهم وَسلّم عَلى خاتَم الأنبياءِ مد

وَعلى آلِهِ وصَحبِهِ ومن والاه..

آم يا رب العا .

عبدالقادر توحيدي

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢

ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣ مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤

إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥ ٱهۡدِنَا

ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ

عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ

وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧

## ١ سورەتی فاتیحە ٧

سورەتی فاتیحە کە یەکەم سورەتی قورئانەو حەوت ئایەتە، سورەتێکی مەکییەو وتراوە جارێکیش لە مدینەدا دابەزیوە واتە دووجار دابەزیوە، ئەم سورەتە زۆربەی ئەو ماناو باسانەی کە لە قورئاندا هاتوە لە خۆدا جێی کردوەتەوە وەك سوپاسو حەمدی پەروەردگارو بەیەکخواناسینو باوەڕ بە دوارۆژو بەندایەتی کردن، جا بۆیە سورەتی" **أم القرآن** " واتە بناغەو ئەساسی قورئانیشی پێدەوترێت، وە هەروەها بە " **ا مد، ا ثا ، الصلاة، الشفاء، الشافية**" وە "**الوافية**" ناو براوە.

ئیبنوعەباس دەڵێت: لە کاتێکدا کە جبرەئیل لەلای پێغەمبەرداﷺ بوو لەلای سەرەوەی خۆی دەنگێکی بیست جا سەری بەرزکردەوەو جبرەیل فەرموی: {**هَذَا مَلَكٌ نَزَلَ إِلَى الأَرْضِ لَمْ يَنْزِلْ قَطُّ إِلا الْيَوْمَ فَسَلَّمَ وَقَالَ أَبْشِرْ بِنُورَيْنِ أُوتِيتَهُمَا لَمْ يُؤْتَهُمَا نَبِيٌّ قَبْلَكَ فَاتِحَةُ الْكِتَابِ وَخَوَاتِيمُ سُورَةِ الْبَقَرَةِ لَنْ تَقْرَأَ بِحَرْفٍ مِنْهُمَا إِلا أُعْطِيتَهُ** /مسلم وغ ه/ ئەمە فریشتەیەکە دابەزیوەتە سەر زەوی کە جگە لە ئەمڕۆ دانەبەزیوەو هاتوسەلامی کردو وتی: موژدەت پێ دەدەم بە دوو نور کە پێتدراوە کە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش تۆنەدراوە، سورەتی فاتیحەو ئایەتەکانی کۆتایی سورەتی بەقەرە، هەر حەرفێك لەوانە بخوێنیت خێری ئەوەت پێ دەدرێت}

جا ئومێد دەکرێت کە ئەوە بۆ ئومەتەکەیشی بێت.

هەروەها ئەبو سەعید کوڕی موعەلا دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {**أَلا أُعَلِّمُكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنَ الْمَسْجِدِ فَأَخَذَ بِيَدِي فَلَما أَرَدْنَا أَنْ نَخْرُجَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّكَ قُلْتَ لأُعَلِّمَنَّكَ أَعْظَمَ سُورَةٍ مِنَ الْقُرْآنِ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ هِيَ السَّبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الَّذِي أُوتِيتُهُ** /متفق عليه/ ئایا گەورەترین سورەتی قورئانت فێر نەکەم پێش ئەوەی کە لە مزگەوت دەربچیت؟ جا دەستی گرتم ئینجا کاتێ ویستمان لەمزگەوت دەربچین وتم: ئەی پێغەمبەری خواﷺ تۆ فەرموت کە گەورەترین سورەتی قورئانت فێردەکەم فەرموی: ﴿ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ کە حەوت ئایەتی دووبارە کراوەیەو ئەو قورئانە گەورەیەیە کە پێم دراوە}

وە هەروەها دەفەرموێ: {**لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ** /متفق عليه/ نوێژ نیە بۆ ئەو کەسەی کەسورەتی فاتیحە نەخوێنێت}

وە عوبادەی کوڕی سامت دەڵێت:{ **كُنَّا خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي صَلاةِ الْفَجْرِ فَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَثَقُلَتْ عَلَيْهِ الْقِرَاءَةُ فَلَما فَرَغَ قَالَ لَعَلَّكُمْ تَقْرَءُونَ خَلْفَ إِمَامِكُمْ قُلْنَا نَعَمْ هَذًّا يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ لا تَفْعَلُوا إِلا بِفَاتِحَةِ الْكِتَابِ فَإِنَّهُ لا صَلاةَ لِمَنْ لَمْ يَقْرَأْ بِهَا** /الترمذي، ابوداود، البخاري جزء القراءة/ ئێمە کاتی نوێژی بەیانی لە پشت پێغەمبەر ﷺدا بوین پێغەمبەرﷺ قورئانی خوێند جا خوێندنەکەی لە سەر گران بو کاتێك کە نوێژەکەی تەواو کرد فەرموی: وادیارە کە لە پشت ئیمامتانەوە ئێوەش قورئان دەخوێنن؛ وتمان: بەڵێ، بە پەلە ئەی پێغەمبەری خواﷺ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: وامەکەن، مەگەر سورەتی فاتیحە چونکە بەراستی ئەوەی کە فاتیحە نەخوێنێت نوێژەکەی بەتاڵە}

جا بۆیە "خەتابی" دەڵێت: (**هَذَا الْحَدِيثُ صَرِيحٌ بِأَنَّ قِرَاءَةَ الْفَاتِحَةِ وَاجِبَةٌ عَلَى مَنْ خَلْفَ الإِمَامِ سَوَاءٌ جَهَرَ الإِمَامُ بِالْقِرَاءَةِ أَوْ خَافَتَ بِهَا ، وَإِسْنَادُهُ جَيِّدٌ لا طَعْنَ فِيهِ**/ واتە ئەم فەرمودەیە بێ پێچو پەنا ئەوە دەگەیەنێ کە خوێدنی فاتیحە واجبە لە سەر ئەو کەسەش کە لە پشت ئیمامەوە نوێژ دەکات جا چی ئیمام دەنگ بەرز بکاتەوە یان نە. سەنەدی فەرمودکەش چاکەو هیچ تانەیەکی لێ نەدراوە) وە ئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافیعی، ئیسحاق، ئەوزاعی، لەیسی کوڕی سەعد، عوروەی کوڕی زوبەیر، سەعیدی کوڕی جوبەیر، حەسەنی بەسری‌ومەکحولە.

ئیمامی بوخاریش دەڵێت: **قَالَ الْحَسَنُ وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ وَمَيْمُونُ بْنُ مِهْرَانَ وَمَا لا أُحْصِي مِنَ التَّابِعِينَ وَأَهْلِ الْعِلْمِ: إِنَّهُ يَقْرَأُ خَلْفَ الإِمَامِ وَإِنْ جَهَرَ**/ واتە: حەسەنو سەعیدی کوڕی جوبەیرو مەیمونی کوڕی مەهران و کومەڵێکی بێژماریش لە تابعینو ئەهلی عیلم وتویانە: کە مەئموم لەپشت ئیمام دا فاتیحەدەخوێنێت ئەگەرچی ئیمامیش بە دەنگی بەرز بخوێنێت.

"شێخ ئەلبانی" لە کتێبی (صفه الصلاه ) باس لە "نسخ" بونی خوێندنی سورەتی فاتیحە دەکات کە لەم فەرمودەدا فەرمانی پێدراوە کەوابو فەرمودەکە بە راست دادەنێتو لە "**مشكاة ا صابيح**" بە "حسن" دای دەنێت. بەڵام پێی وایە "نسخ" بوەتەوە کە ئەمە رایەکی لاوازە چونکە وتراوە: ( **لا نسخ مع امكان ا مع. ولا يتم النسخ إلا عرفة التاريخ. وا ثبت مقدم على النا و**...

وە هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: {**إِذَا قَرَأْتُمُ الْحَمْدُلِلَّهِ فَاقْرَءُوا** ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ **إنها أم القرآن وأم الكتاب والسبعُ الْمَثَا بسم ا الر ن الرحيم إِحْدَى آيَاتِهَا** /البيهقي، صححه الالبا / هەرکاتێ سورەتی فاتیحەتان خوێند ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ بخوێنن کە

بەراستی ئەو سورەتە ئەساسی ئەم قورئانەو بناغەی ئەم کتێبەیەو حەوت ئایەتێکی دووبارە کراوەیە، وە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ئایەتێکە لەو سورەتە.

(١) بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان.

ئەمە ئایەتێکی قورئانەو لە سەرەتای ئەم سورەتەوە نوسراوە، هەندێك لە زانایان پێیان وایە ئایەتێکە لە سەرەتای هەموو سوورەتەکاندا، چونکە ئیبنو عەباس دەڵێ: كَانَ النبي ﷺ لَا يَعْرِفُ فَصْلَ السورَةِ حَتى تَنزلَ عَلَيْهِ بِسْمِ اللهِ الرحْمَن الرحِيم. /ابوداود، صححه الألبا / واتە پێغەمبەر ﷺ بە جیاکردنەوەی سورەتێك لە سورەتێکی دیکەی نەدەزانی هەتا ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ی بۆ دەهاتەخوارەوە. جا خۆ ئەگەر لە هەمو شوێنێکیش ئایەت نەبێت بێگومان لە سوورەتی ( نەمل) دا بەشی ئایەتێکە. وە بە فەرمودەیش سابت بوە کە بەشێکە لە سورەتی فاتیحەو کەوسەر چونکە ئەنەسی کوری مالیك بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {أُنزلَتْ عَلي آنِفًا سُورَةٌ فَقَرَأَ ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ (٣)﴾ /مسلم وغ ه/ ئێستا سورەتێکم بۆ دابەزی جا خوێندیەوە: ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ (١)﴾... تاکۆتایی سورەتەکە}

ئەمڕۆ بەهۆی پێشکەوتنی زانیاری‌و کەرەستەکانیەوە دەرکەوتوە کە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ یەکێکە لە موعجیزە گەورەکانی قورئان، چونکە پێك هاتوە لە نۆزدە پیت کە هەمو پیتە تاکەکانی (ا روف ا فطعة) سەرەتای ئەو سورەتانەی کەتێیدا هاتون بەبێ ماوە بەسەریدا دابەش دەبن، هەروەها ژمارەی سورەتەکانی قورئان کە سەدوچواردەیە بەبێ ماوە بەسەریدا دابەش دەبێت‌و هاتنی خۆیشی بەسەر نۆزدەدا بە بێماوە دابەش دەبێت. ژمارەی نۆزدەش لەسورەتی مودەسیردا هاتوە، جا بێجگە لە ﷲ کێ دەتوانێ کاری ئاوەها بکات بەبێ ئەوەی کە ئالۆزییەك لە مانای دا هەبێت، بەڵکو قورئان لە ڕێکوپێکی‌و ڕەوان بێژیدا لە ئاستێکدایە کەتەواوی ڕەوان بێژانی سەرسام کردوە.

وتراوە پیتی (با) لە﴿بِسۡمِ﴾ بۆ یارمەتیە، واتە ئەم عیبادەتەی کە دەیکەم یان ئەم قورئانەی کە دەیخوێنم تەنها بە ناوو یارمەتی خواوە ئەنجامی دەدەم نەك بە یارمەتی وەرگرتن لە کەسی دیکەو کەسیش ناکەم بە شەریکی ئەو زاتە، چونکە هەر کەسێ بکەم بە هاوبەشی ﷲ ئەوە زیانم بەخۆم گەیاندوەو پاشە ڕۆژیش دەستم خاڵی دەبێ. کەواتە باوەڕدار تەنها بەناوی ئەو زاتەوەو تەنها بەوویش دەست بە دوعاو پاڕانەوە دەکات، کام ناو؟ بەناوی ﷲ وە کە ئەم ناوە تایبەتە بەو زاتە چونکە کۆکەرەوەی هەمو سیفەتێکی جوان‌و تەواوو کەماڵە کە ئەمەش بێجگە لە پەروەردگار لەهیچ کەسێکدا نایەتە دی هەروەها وشەی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ تایبەت بە پەروەردگاری جیهانە وەك وشەی (ﷲ) چونکە تەنها ئەو زاتەیە کە سۆزو میهرەبانیەکەی هەمو بونەوەری گرتوەتەوە جا لەبەر ئەوە ناو بردنی هەندێ کەس بەناوی ڕەحمانەوە هەڵەیە، دەبێ ناوێکی تری بۆ دابنرێت وەك (عبدالر ن) بەڵام باقی ناوەکانی تری پەروەردگار دروستە بۆ کەسێك بەکار ببرێت خۆ ئەوانیش ئەگەر لەپاش وشەی (عبد)ەوە بێت ئەوە باشترە، بەڵام ناوی (ﷲ) و ڕەحمان تایبەتی پەروەردگارن. بەراستی مرۆڤ بەبێ ناسینی پەروەردگاری خۆی ڕێ لێ گومبوو سەرگەردانە، وە بەناسینی ئەو زاتەش دووبارە سەرگەردانە لە حەقیقەتەکەی‌و ناتوانێت تەشبیهی بکات، نازانێ بلێ چۆنە، تەنها باوەڕی بەوە هەیە کە زاتێکی زاناو کاربەجێ‌و توانای وایە کە پەروەردگارو بەدیهێنەری هەمو بونەوەرەو هەمو ئاڵو گۆڕێکی ئەم بونەوەرە تەنها بەدەست ئەوەو تەنها ئەویشە کە شایانی ئەوەیە کە بەندایەتی بۆ بکرێت، زاتێك کە وێنەی نییە نە لە زاتیداو نە لە سیفاتیداو نەلە کرداری دا لەبەر ئەوە مرۆڤ ناتوانێت بەشێوە دەرکی بکات، بەڵکو شاکارەکانی لەم بونەوەرەدا بەڵگەگەلێکی ڕۆشنن لەسەر زانایی‌و دانایی‌و دەسەڵاتوهێزی ئەو زاتە کە بە یادی ئەو دڵەکان ئارام دەگرن، جا جێی خۆیەتی کە سوپاسی بکەین‌و خۆشمان بوێت تا باوەڕێکی ڕاستەقینە لە دڵماندا سەقامگیر ببێت‌و شیرینی ئەو ئیمانەش هەست پێبکەین، هەروەك لە فەرمودەیەکی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە کە فەرمویەتی:{ثَلَاثٌ مَنْ كُن فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيَان أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَحَب إِلَيْهِ مِما سِوَاهُمَا /البخاری/ سێ شت هەیە کە هەرکەسێك تێیدا هەبێت تامی شیرینی ئیمان دەکات: یەکێکیان ئەوەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لە هەمو کەس خۆشەویستربن لە لای}

چونکە پەروەردگار سەرچاوەی بونو ژیانمانە جا کەسێك سپڵەو بێنمەك نەبێت چۆن دەبێت کە ئەو زاتەی خۆش نەوێ؟ ئاشکرایە کەتاکە ڕێگایەك لەم سەردەمەدا کەئەو زاتە بە ڕێكوپێکی بەمرۆڤ بناسێنێت ڕێگای دواترین پێغەمبەری خوایە کە محمدی کوڕی عەبدوڵای قورەیشی عەرەبیە ﷺ کەلەشاری مەکە ساڵی فیل لەدایك بوەو لە چل ساڵیدا بوە بە پێغەمبەرو پاش سیانزە ساڵ کۆچی کردوە بۆ مەدینەو پاش دە ساڵ لە شاری مەدینەدا لە پاش بیستو سێ ساڵ خەباتی بێ وچان بۆ ڕزگاری مرۆڤ لە بەندایەتی بەندە بۆ بەندایەتی پەروەردگاری جیهان وەفاتی کردوەو تەرمە پیرۆزەکەی لەگەل هەر دوو هاوەڵە گیان فیداو دڵسۆزەکەیدا (ابوبکرو عمر) لە ماڵی دایکی باوەڕدارانداو خاتون عائیشەی خێزانی پێغەمبەر دفن کراون(خوالەهەموویان ڕازی بێ)و لێژنە لافاوی ڕەحمەتی خوا بڕژێ بەسەر گیانی پیرۆزی خۆیو هەردوو هاوەڵە ڕاستو گیان فیداکەی وتەواوی کەسو کارو یارو پەیڕەوانیدا، جا لەبەر ئەو خزمەتە بەنرخە، پێویستە کە ئەو پێغەمبەرەشمان ﷺخۆش بوێت، کە ئەوە مەرجی ڕاستی ئیمانە وەك دەفەرموێ: {فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ ـ و رواية ـ وَالنَّاسِ أَجْمَعِ ـ /البخاري/ جا سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە هیچکام لە ئێوە ئیمانی نیە هەتا من خۆشەویستر نەبم لەلای لە باوكو منداڵی ـ لەریوایەتێکی تری دا هاتوە ـ وەلە هەموخەڵك}

کەواتە مرۆڤ پێویستە بەو پەڕی خۆشەویستیو شەوقو زەوقەوە بەندایەتی تەنها بۆ پەروەردگاری جیهان بکات، بەڵێ ئەوکەسەی کە باوەڕی بە خوای گەورە هەیە خۆی بە نیازمەندی ئەو دەزانێتو باوەڕی وایە کە ئەوەندە نیعمەتی ئەو زاتەی لایە کە ناتوانێ بیژمێرێتو هەمیشە خۆی بە قەرزاری ئەو دەزانێت وتراوە"موسڵمان نابێ دووڕۆژی وەك یەك بێت"بەڵکو پێویستە مرۆڤ هەتا دەمرێت ڕۆژبە ڕۆژ هەوڵ بدات کە پەروەردگاری خۆی چاکتر بناسێتو بیرو باوەڕی خۆی بەهێز تر بکات. بەڵێ کەرۆژی قیامەت هاتو شادبوین بەدیداری پەروەردگار ئینجا هەندێك حەقایق دەزانین، کەوابوو هەندێ لە مانای قورئان موتەشابیهەو ڕاستیەکەی تێناگەینو نایزانین. وەك خواخۆی دەفەرموێ، قورئان دوو بەشە بەشێکی ڕۆشنەو ماناکەی دەزانین وە بەشێکی موتەشابیهەو حەقیقەتی ماناکەی نازانین. جا ئەو بەشەی کە موتەشابیهە مەرج نیە سەدا سەد هەتا قیامەت نەزانرێت بەڵکو بەگوێرەی زەمان هەندێکمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە، واتە زەمان بۆمان مانا دەکات. بۆ نمونە: چۆنیەتی دروست بوونی باران کەلە پێشدا زانراوە کە باران لە هەور دەبارێت، بەلأم ئەوە بەم شێوەیە نەزانراوە کە ئەمڕۆ زانست دەرکی کردوە، کەواتە بۆ ئەو کاتە موتەشابیهە، بەلأم ئێستا زانراوە. وەك لە سورەتی فوسیلەتدا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿بەبێگومان ئەوانەی کەوتیان: پەروەردگارمان اللّٰه یە پاشان ڕاست وەستاون لەسەر ئایین لە کاتی گیان دەرچونیاندا فریشتەکان دێنەلایانو پێیان دەڵێن: مەترسن لەوەی کە چاوەڕوانیتان دەکاتو خەمی ئەوەش مەخۆن کە بەجێتان هێشتوە﴾

ئێمە ئێستا نازانین قسەی ئەو فریشتانە چۆنە تا کاتی سەرەمەرگ، ئەو کاتە دەزانین کە چۆن دێنو چۆن قسەدەکەن. ئێمە زیندو دەکرێینەوە بەلأم ئێستا نازانین کە چۆن زیندو دەکرێینەوە یان وەلأم دانەوو ژیانو خۆشیو ناخۆشیەکانی ناو قەبر چۆنە، ئەمانە هەموی موتەشابیهن تا ئەو کاتەی کە پێی دەگەین لەپاشان زیندو دەکرێینەوە بۆ حەشرو هەمو بە ڕوتو قووتی ڕودەکەینە ئەو دەشتو بیابانانەو لە جێگای دیاریدا کۆ دەبینەوە، چۆنێتی ئەو حەشرە نازانین، چونکە ئەو خەڵکە هەندێکی بوە بە خۆڵو هەندێکی چووەتە ناو سکی ماسی لەناو دەریاداو لەوێشدا تواوەتەوەو هەندێکی حەیواناتی تر خواردویەتی لە هەمان کاتدا باوەڕمان وایە کە هەمویان زیندو دەکرێنەوەو هەمو ئەندامەکانیان کۆدەکرێنەوە تەنانەت سەر ئەنگوشتەکانیشیان وەك خۆی لێدەکرێتەوەو هیچی لێ ون نابێت، جا لە وێوە تا سەر پردی سیراتو بەهەشتو میوەکانی هەموی موتەشابیهەو ئا لەو کاتەدا ماناکەی دەزانین، کە واتە ئێمە لێرە بەئاسانی لەوە حاڵی نابینو بەپێوەری ئەمرۆی ئێمە ناپێورێت بەس تەنها ئەوە دەزانین کە حەقەو باوەڕمان پێی هەیەو حەقیقەتی چۆنێتی ئەو هەموو شتانە خوای گەورە هەر خۆی دەیزانێ.

ئەگەر دەڵێی بۆچی ئێمە نایزانینو بۆچی موتەشابیهە؟ دەڵێین: خوا هیچ شتێکی بێ کەڵكو بێ سود دروست نەکردوەو هەر شتێك کە دروست بوە سودێکی هەیە چ ئێمە بەو سودە بزانین یان نەزانین لای کەم بۆ ئەوەیە کە بزانین خالقێك هەیەو حیسابێك هەیەو ئێمە بەو دەکاتەوەو بۆ تاقی کردنەوەش دروستیکردوین، بۆ نموونە: دروست بوونی شەیتان لەوانەیە بڵێن تەنها بۆ شەڕە، نەخێر ئەو پلە گەورانەی کە مرۆڤ دەستی دەکەوێ، ئەگەر شەیتان نەبوایە مرۆڤ وەك ئینسانێکی خاووخێچو بێ چارە دەکەوتو هیچی نەدەکرد، بەڵام بەبۆنەی بونی شەیتانەوە مرۆڤ ئەو هەمو پلە گەورە گەورە دەبرێتو ڕۆژی قیامەت بەرز دەکرێتەوە، چونکە ئەو لەدنیادا شەیتان دوژمنایەتی کردوەو ویستویەتی فریوی بدات بەڵام ئەو بە گوێی شەیتانی نەکردوە و نەفسی خۆیو شەیتانی بەزاندوە جا بەو پلە بەرزانە گەیشتوە، کەواتە بوونی شەیتان هەرشەڕی روت نیە بەڵکو مایەی خێرێکی گەورەیشە بۆمرۆڤە راستەکان، ئەگەر ئەو دوژمنە نەبوایە ئەو پلە گەورەو بەرزانەیان دەست نەدەکەوت. کەواتە کاتێك کە لە مەخلوقات زۆر شتێك هەیە کە ئێمە لێی بێ ئاگاینو ناتوانین حەقیقەتەکەی بە تەواوی دەرك بکەینو لە عەقڵی خۆماندا بیگونجێنین چۆن دەتوانیین بە تەواوەتی ئەو زاتە باڵادەستە بناسینو باس لە چۆنیەتی وەسفەکانو کردارەکانی بکەین؟ کەواتە باوەڕمان بە ناوو سیفەتەکانی پەروەردگار هەیە بە بێ ئەوەی کە ماناکانی بگۆڕین یان باس لە چۆنیەتیەکەی بکەین یان بیچوێنین بە دروستکراوەکانیەوە، جا ئەو نەزانینە لە راستیدا نیشانەی ئەوەیە کە تۆ پەروەردگاری خۆتت ناسیوەو زانیوتە کە لەوە گەورەترە کە لە عەقڵو مێشکی تۆ دا جێی ببێتەوە.

ئینجا پەروەردگار بەدوای وشەی (ٱللَّهُ)دا وشەی(ٱلرَّحۡمَٰنِ)ی هێناوە، واتە ئەگەر کەسانێك خواناس بن ئەو (ٱللَّهُ) یە، ئەو خاوەن هێزە، ئەو خاوەن دەسەڵاتە ئەوەی کەوا تەواوی سیفەتەکانی کەماڵو جەماڵی تێدایە با وا نەزانن کە هەر بۆخۆیەتیو هیچی تر، نەخێر ئەو (ٱللَّهُ) یە زۆر بەسۆزە بۆ هەمو بەندەکانی بەدۆستو دوژمنییەوە، ئەوەی هەیە ئەگەر سۆزی ئەو زاتە نەیگرێتەوە بونی نییە جا لەبەر ئەو سۆزە زۆرەیە زۆر بەخشندەیەو هەمو دروستکراوەکانی خۆی غەرقی نیعمەت کردوە. مرۆڤ ئەگەر ژیرانە تەماشای خۆی بکات دەزانێ ئەوەندە نیعمەتی گەورەو بەنرخی پەروەردگاری لایە کە ناتوانێت بیانژمێرێت جگە لەوەی کە بیەوێت سوپاسی بکات کە هێزی بینینو بیستنو بیرکردنەوە بەشێکن لەو نیعمەتە زۆرو فرەوانەی (ٱللَّهُ) کەبە هیچ نرخێك ناکڕێن، وە هەزاران نیعمەتی تری خۆی خستوەتە ژێردەستی ئێمەوە، بیر بکەرەوە ئەگەر باران نەبارێت ئایا ئێمە چیمان پێدەکرێت؟ ئایا دەتوانین پەڵە هەورێك دروست بکەین؟ بەڵێ ئەو زاتە ڕەحمانەو ئەو هەمو بارانە دەبارێنێو ئەو هەمو کانیاوو روبارە بۆ ئێمەبەدی دێنێتو بەو ئاوە ئەو هەمو بەروبومانە دەڕوێنێت کە بۆ سوودو بەرژەوەندی مرۆڤن چونکە ڕەحمانە.

﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ واتە بێنیهایەت میهرەبان، هەندێك پێیان وایە کە وشەی ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ چوونکە پیتێکی زیاترە لە ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بە واتای خوا ڕەحمانە بۆ هەمو شتێك وە بۆ هەمو مرۆڤێك لەدنیادا کافر بێت یان موسڵمان بەڵام ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ پیتێکی کەمترە بۆیە ماناکەی کەمترە لە مانای ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ﴾ واتە سۆزو بەزەیی ومیهرەبانی ٱللَّهِ لە قیامەت دا تایبەتی ئیمان دارانە بەڵام کافرو موشریكو موناڤق ناگرێتەوە ئەوان بەرەو جەهەننەم دەبرێن، هەندێکیش وتویانە ڕەحمان واتە ئەوزاتەی کە خاوەنی وەسفی سۆزو بەزەییەو ئەوەش کە بەکردەوە میهرەبانی دەنوێنێت ئەوە ڕەحیمە کەوابو ڕەحمان وەسفێکی زاتیە (**صفة الذاتية**) و ڕەحیمیش وەسفێکی کرداریە (**صفة الفعلية**)بۆ پەروەردگار.

بزانە ئەوەبەندەانەی کە خاوەنی وەسفی سۆزو میهرەبانی بن سۆزی پەروەردگار لێیان نزیکترە، ئافرەتێك کە دوو منداڵی لەگەڵدا بو هاتە لای دایکمان عایشەو ئەویش سێ خورمای پێدا جا دوو لە خورماکانی دا بە دەست منداڵەکانیو دانەیەکەیشی بۆ خۆی هەڵگرت جا منداڵەکانی دوو خورماکەی خۆیان خواردو تەماشای ئەوەیشان دەکرد کە بەدەست دایکیانەوەیە جا ئەو خورمایەشی کرد بە دوو بەشو پێی دان کاتێك پێغەمبەرﷺ هاتەوە عایشە ئەوەی بۆباس کرد پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: {وَمَا يُعْجِبُكِ مِنْ ذَلِكَ لَقَدْ رَحِمَهَا ا ُ بِرَحْمَتِهَا صَبِيَّيْهَا /الأدب ا فرد، صحه الالبا / لەچی سەرت سوڕماوە بێگومان ٱللَّهُ ڕەحمی پێکرد بەهۆی ئەو ڕەحمو سۆزەی کە بە منداڵەکانی کرد}

بەڵکو پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ لَا يَرْحَمُ لَا يُرْحَمُ /متفق علیه/ ئەوەی کە سۆزو ڕەحمی نەبێت ڕەحمی پێناکرێت} جا مادام پەروەردگارمان خاوەنی ئەو هەمو گەورەیو دەسەڵاتەیەو تەواوی سیفاتی کەمالو جەمالی تێدایەو خاوەنی ئەو هەمو نیعمەتانەیە

كە گەورەترینیان نیعمەتی ئیسلامەو هیدایەتە، ئێمەش لەناخی دڵمانەوە دەڵێین:

(٢) تەواوی سوپاس بۆ ٱللَّهِ یە کە پەروەردگاری جیهانیانە،

لەبارەی جیاوازی نێوان وشەی (حَمدُ وشُكر و ثَناء) وتراوە حەمد هەر بەزمان دەکرێت لەسەر نیعمەتو غەیری نیعمەت، بەڵام شوکر بە هەمو شێوەیەك دەکرێت بەڵام تەنها لەسەر نیعمەت، سەنا لەسەر هەردووکیان دەکرێت نیعمەت و غەیری نیعمەت، بە زمانو غەیری زمانیش دەبێت. کەوابو هەر لەسەر ئەوەی کە خوای گەورە خاوەنی عەزەمەتو گەورەییە حەقی حەمدو سەنای هەیە. هەروەك چۆن لەسەر ئەو هەمو نیعمەتانەش حەقی حەمدو شوكرو سەنای هەیە.

دوو پیتی (ال)ی ﴿ٱلْحَمْدُ﴾ پێی دەوترێت (الْـ) ی ئیستغراق‌و مانای هەمو دەگەیەنێت، واتە ( كُلّ الحَمد لله) ئەوەی کە حەمدو سوپاس بێت هەموی شایستەی ﷲ))یە، چونکە سەرچاوەی هەمو نیعمەتێك لە خواوەیەو هەر کەسێك هەرچی نیعمەتی هەبێت هەموی موڵکی خوایە تەنانەت ئەگەر کەسێك یارمەتی کەسێك بدات ئەویش هەر موڵکی خوایە جا لەپاش سوپاسی خوا ئینجا پێویستە سوپاسی کابرای بەخشندەش بکرێت چونکە بناغەی نیعمەتەکە لای خوایەو ئەو کابرایە جێنشینە تێیدا بە کابرای تری دەدات، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە ئەگەرﷲ ئەو سۆزو بەزەییەی نەخستایە دڵیەوە ئەو یارمەتی ئەو هاونەوعەی خۆی نەدەدا کەوابو لەو یارمەتیەدا گەورەترین بەش هەر هی ﷲ یە، لەبەر ئەوە تەواوی حەمد حەق‌و مافی پەروەردگاری بەشکۆو بەدیهێنەرە، ئینجا ئەگەر کەسێك یارمەتیت دەدات لەباتی وشەی حەمد، وشەی شوکر بەکاربێنە تا وشەی حەمد هەر بۆ خوا بێت بۆیە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: {مَنْ لَمْ يَشْكُرْ النَاسَ لَمْ يَشْكُرْ اللهَ /الترمذي، صححه الالبا/} واتە کەسێك سوپاسی خەڵك نەکات، سوپاسی خواش ناکات} وە نەیفەرمو: (مَنْ لَمْ يَحمِدِ النَاسَ).

پاشان وەسفی ئەو زاتە دەکەین بەوەی کە ﴿رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ ـە وشەی (رَبّ) بە مانای پەروەردەکەرو سەرپەرشتیکەرو چاودێری کەرە، واتە ئەو کەسەی کە شتێك دروست دەکات و پاشان لە ژێر چاودێری خۆیدا بۆ ئەو ئامانجەی کە دەیەوێت پەروەردەی دەکاتو گەشەی پێدەدات کە ئەمە پەروەردە کردنێکی گشتییە بەڵام پەروەردگار ئەوانەی کە بەندە راستەقینەکانی خۆیەتی پەروەردەیەکی تایبەتیان دەکاتو هیدایەتیان دەداتو دڵو دەرونیان ئاوەدان دەکاتەوەو بەرەو کەماڵو بەرزی پەروەردەیان دەکاتو گەشەیان پێدەدات ، وشەی(ربّ) بەتەنهایی دەبێ بۆ ﷲ بەکار بهێنرێت بەڵام ئەگەر درا بە لای وشەیەکی تردا ئەوە دەکرێت بۆ غەیری ﷲ ش بەکار بهێنرێت بۆ نمونە: بە ئافرەت دەوترێت (ربة البيت) وە بە پیاویش دەوترێت (رب البيت). بەڵام ئەوەی کە لە بنەڕەتدا پەروەردەی هەمو شت دەکات هەر خوایە واتە پێویستە بزانین کە هەرچی پەروەردەکراو هەیەو ئەوەیش کە پەروەردەی شتێ دەکات هەر بە هۆی تێگەیاندن وهەستو سۆزێکەوەیە کە ﷲ پێی داوە، واتە حەقیقەتی (ربّ) تەنها هەر ﷲیە کە پەروەردگاری عالەمە، وشەی ﴿ٱلْعَـٰلَمِينَ﴾ کۆیەو بە جەمعی موزەکەری عاقڵ کۆکراوەتەوە مەبەست لە عالەم ( ما سوى ﷲ) یە واتە بێجگە لە خوا پێ دەوترێت عالەم بەڵام لێرەدا کۆکراوەتەوە هەر بەو مانایە، هەندێك پێیان وایە عالەمین بۆیە کۆکراوەتەوە بۆ موزەکەری عاقڵ مەبەستی ئینسانو فریشتەو جنۆکەیە واتە وشەکە کۆکراوەتەوەو ماناکەی بچووك کراوەتەوە کە ئەمەش رێزێکی تایبەتە بۆ ئەو سێ جۆرە دروستکراوانە واتە: ئەم بوونەوەرەو ئەوەش کە دروستکراوە تێیداو رەوانەکردنی ئەم هەمو پێغەمبەرانە بۆ ئێوەنو لە بەر خاتری ئینسانو جنۆکەیە کە فریشتەکانیش بەفەرمانی خوا دەورێکی گەورەو گرنگیان هەیە لەنێوان خوا وئەودوو عالەمەداو باقی دروستکراوەکانی تر گەردن کەچو رامن بۆیان کەواتە پێویستە ئەم سێ دروستکراوی گرنگە چاك خوای خۆیان بناسنو بە دڵو زمانو کرداکار سوپاسی بکەن کەفریشتەکان دەیکەن، ئینجا کە باسی عالەم کراو سرنجی بۆڵای ئەم بونەوەرە گەورەیە راکێشا جالەم حاڵەتەدا مرۆڤی باوەڕداری لە خوا ترس لە دڵەوە هەست بەشتێکی گرنگ دەکاتو پرسیار لە خۆی دەکاتو دەڵێ: ئەو خوایەی کە خاوەنی هەمو سیفەتێکی جەمالو کەماڵە، ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەمو عالەمە جا من کێمو کەی شایستەی ئەوەم هەیە کە ئێستا لە بەرامبەر ئەوەوە بوەستم؟ یان من چیم کە سووپاسی ئەو زاتە بکەم لە کاتێکدا کە قورسایی باری تاوان شانمی چەماندوەتەوە؟ جا لەو کاتەدا بەم دوسیفەتە بەنرخەیی ئاراموهێوری دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٣) ئەو ( ﷲ)یە کە هەموی هەر سۆزو میهرەبانیە.

لێرە ئەوە دوبارە دەکاتەوە تا ئەو ترسو لاوازیەی کە چووتە ناو دڵی باوەڕدارەوە رای نەکێشێ بۆ نائومێدی کە دەست بشوات لە هەمو شتێك‌و بڵێت خوایە کە ئاوایە من چیم کە سوپاسی بکەم‌و سوپاسی من بەکوێ دەگاتو شەیتان ئەم بۆ چونەی بەخواناسی بۆ دانێتو ئیتر پاڵی لێبداتەوەو لێی دوور کەوێتەوە، کەواتە نائومێد مەبەو زیاتر هەوڵی بۆ بدە چونکە ئەو خوایەی کە تۆ دەیپەرەستی رەحمانو رەحیمە، هەندێکیش پێیان وایە وشەی ﴿ٱلرَّحْمَٰنِ﴾ واتە بەخشندەیەك کە زۆر زۆر دەبەخشێت لە هەمو

بابەتێك وبە هەمو جۆرێكەوە، بەڵام وشەی ﴿ٱلرَّحِيمِ﴾ بەخشندەی بەردەوامە، واتە خوای گەورە زۆرزۆر بەخشندەیەو بە بەردەوامیش دەبەخشێتو هیچ كات كۆتای بە بەخشینی نایەت.

جا بەم ناوانە هێورییەك رو لەو دڵانە دەكات بەڵام سروشتی مرۆڤ وایە هەر كە كەوتەناو نازو نیعمەتەوەو ترسی نەما ئیتر لە خۆی بایی دەبێت وەك ﷲ لە سورەتی عەلەقدا دەفەرموێ: ﴿حەقەو راستە، بەبێگومان مرۆڤ وا دروست بووە كاتێ كە دیتی بێ نیازە توغیان دەكاتو لە خۆبایی دەبێت﴾

جا بۆیە زۆر كەسیش هەیە كە پێی دەوترێت دەست لە تاوان بكێشەرەوەو لە خوا بترسە دەڵێت: خوا رەحمانو رەحیمە و لێمان خۆش دەبێتو بەم قسەیە خۆی فریو دەداتو پێێ وایە ئیتر ئیستراحەت دەكاتو حیسابی لە گەڵدا ناكرێت. بەڵێ ئەم جۆرە هێور بونەوەش هەروەكو نائومێدی تاوانە جا بۆیە بەدوای ئەوەدا دەفەرموێ:

(٤) ئەو ﷲ یە پاشاو خاوەنی رۆژی دینە.

لەم ئایەتەدا ئەگەر (مالِك) واتە خاوەن بە (مَلِك) واتە پاشاوخاوەن دەسەلات بخوێنرێتەوە ئەوەش هەر دروستەو شێوازێكە لە خوێندنەوەكان، هەندێك وتویانە وشەی دین لێرەدا بەمانای سزاو پاداشت دانەوەیە كە مەبەست رۆژی قیامەتە، من پێم وایە وشەی دین ئەگەر ناوێكیش بێت لە ناوەكانی رۆژی قیامەت، لەبەر ئەوەیە چونكە ئەو رۆژە پرسیار لەدینت دەكەن نە نەژادو رەنگو تیرەو بەرەباب، بەڵێ خوا پاشای دنیاو قیامەتە بەڵام لەدنیادا ماوەی داوە كە مرۆڤ خاوەنی هەندێ شت بێت، هەندێك بۆ ماوەیەك پاشاو خاوەن دەسەڵات بن بەڵام لەرۆژی قیامەتدا ئەو خاوەنیەتیە بەكەس نادات وەك لە سورەتی غافردا دەفەرمووێ: ﴿ لِّمَنِ ٱلْمُلْكُ ٱلْيَوْمَ / غافر: ١٦ / ئەمرۆ كێ خاوەنی موڵكە؟ ﴾ كەس نیە وەڵام بداتەوە لەو رۆژەدا ئەو هەمو پاشایانەی دنیا كە هیچ نرخێكیان بۆكەس دانەدەناو زوڵمو زۆرداریان هەموخەڵكی لەدەست خستبو ئەو رۆژە هیچ فزەیەكیان لێوە نایەو بێ دەنگو سەرشۆڕنو وەڵامیان نابێ، خوای گەورە خۆی وەڵامی خۆی دەداتەوەو دەفەرموێ: ﴿ لِلَّهِ ٱلْوَٰحِدِ ٱلْقَهَّارِ /غافر: ١٦/ تەنها بۆ ﷲ یەكە كە تاكو تەنهایەو بەسەر هەموشتێكدا زاڵە﴾ بەڵێ ئەو رۆژە هیچ كەس نیە قسە بكات تەنانەت فریشتەكانیش، مەگەر بە ئیجازەی ﷲ، ئەو كاتە خزم خزمانەو عەشیرەت عەشیرەتانەو كێ كوڕی كێیە سوودی نابێت وەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {مَنْ بَطأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ /مسلم وغ ٥/ ئەو كەسەی كە لە دنیادا كردارەكەی دوای خستبێت لە دینی خوادا، نەژادەكەی پێشی ناخات} واتە تەنها بەرنامەو دینەو هیچی تر، وەكو لە فەرمودەیەكی تری پێغەمبەرداﷺ هاتوە كە دەفەرموێ: {فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتبِعْ فَمِنْهُمْ مَنْ يَتبِعُ الشَّمْسَ وَمِنْهُمْ مَنْ يَتبِعُ الْقَمَرَ وَمِنْهُمْ مَنْ يَتبِعُ الطَّوَاغِيتَ وَتَبْقَى هَذِهِ الأُمَّةُ فِيهَا مُنَافِقُوهَا.../متفق علیه/ رۆژی حەشر ﷲ دەفەرموێ: هەر كەسێ لە دنیادا چی پەرستوە با بڕوات لەگەڵ ئەو پەرستراوەی خۆی دا جا هەندێكیان بە شوێن رۆژو هەندێكیش بە شوێن مانگو هەندێكی تر بە شوێن ئەوانە دەڕۆن كە لە باتی ﷲ بەندایەتیان بۆ كردون، وە ئەم ئومەتە دەمێنێتەوە كە دوورووەكانیشان لە ناودایە...} جا لەو كاتەدا ﷲ فرمان دەكات كەسوجدە ببەن جا هەمو سوجدە دەبەن بەڵام مونافقان پشتیان رەق دەبێتو ناتوانن سوجدە ببەن ئەو كاتەش كۆمەڵی مونافق لەموسڵمانان جیا دەكرێنەوە. كەواتە ئەو رۆژە رۆژی دینو بەرنامەیە واتە ئەوەی كە لەو رۆژەدا دەور دەبینێت رێبازو ئایینێكە كە مرۆڤ لە ژیانی دنیادا دەستی پێوە گرتوە،

جا ئێمە وەك موسڵمان پێویستە ئاگامان لە خۆمان هەبێتو جگەلە بەرنامەی خوا پەیڕەوی هیچ كەسو هیچ بەرنامەیەكی تر نەكەین. جا پاش ئەوە كە خوای گەورە تێی گەیاندین كە خاوەنی سۆزو بەزەی یە، خاوەنی ئەو رۆژەیشە وەك دەفەرموێ: ﴿مژدە بدە بە بەندەكانم كە هەر منم بە رەحمو سۆزم، وە هەروەها منم خاوەنی عەزابێكی دەرد ناك﴾ كەواتە هەردوكیان وەك یەك وەسفی خودان هەروەك چۆن سۆزو رەحمی هەیە هەروایش عەزابی سەختی هەیە.

لەراستیدا مرۆڤی موسڵمان كە عیبادەتی خوا دەكات هەم دەترسێ لە خوا كە لێی خۆش نەبێ و فڕێی بداتە ناو جەهەنمەوە، هەم هیوادریشە كە ﷲ تۆڵەی لێ نەسێنێو بیخاتە ناو بەهەشتەوە، جا مرۆڤ ئەگەر نائومێد بێت لە رەحمی خوا هەر گوناهە، وەئەگەر دڵنیاش بوو هەر تاوانە. دەبێ عیبادەتی مرۆڤ لە بەینی ترسو دڵنیایی دا بێت، چونكە نائومێدی مرۆڤ بەرەو تاوانو گوناح دەباتو هێور بوونەوەش مرۆڤ بەرەو لەخۆبایی بوونو كەمتەر خەمی دەبات كەواتە ئومێدو ترس دوو باڵی فڕینن بۆ گەیشتن بە رەزامەندی پەروەردگار كە بە نەبونی یەكێكیان ئەوی تریان هیچی پێناكرێت.

﴿٥﴾ هەر تەنها بەندایەتی بۆ تۆ دەکەین، تەنها تۆ دەپەرستین، جگە لە تۆ ناپەرستین‌و هەر لە تۆش داوای یارمەتی دەکەین‌و جگە لە تۆ داوای یارمەتی لەکەسی تر ناکەین.

ئەمە دروشمی باوەڕدارەو بەراست کردنمان لەم بڕیارەماندا دەبین بە ئەهلی تەوحید. پێش خستنی وشەی ﴿ إِيَّاكَ ﴾ لە هەردوو رستەکەدا بۆ(حصر)ە واتە کورت کردنەوەی کارەکە لەو شتەدا دەگەیەنێ، جا لادان لەو مانایە لادانە لە یەکخواپەرستی راست‌و دروست، وە پێویستە بزانیت کە عیبادەت هەر رکوع‌و سوجدەبردن‌و نوێژ کردن نیە بەڵکو عیبادەت هەمو ئەوشتانەیە کە پەروەردگار خۆشی دەوێت‌و بەوانە رازیە جا بەدڵ بکرێت یان بە زمان یان بە لەش واتە پەیڕەوی کردن‌و بەجێهێنانی فەرمانی پەروەردگار لەسەر ئەساسی خۆشەویستی‌و ئیخلاصە، بۆ نمونە: زەکات، پارە دانە بەڵام عیبادەتە، حەج گەشت‌وگوزارە بەڵام عیبادەتە، ئەمر بە چاکەو بەرگری لەخراپە فەرمانکردنە بەڵام عیبادەتە، نەکردنی گوناح تەرکی شتێکە بەڵام عیبادەتە، خۆشەویستی بۆ باوەڕداران‌و رقبون لە بێ باوەڕان بناغەکەی لە دڵدایە لە حاڵێکدا مەرجی راستی‌ودروستی ئیمانە‌و عیبادەتە. واتە ئەنجامدانی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بچووك بێت یان گەورە عیبادەتە هەر لە لابردنی بەردێك لە رێگادا هەتا وتنی گەورەترین وشە کە (لَآ إِلَهَ إِلَّا ٱللَّهُ)یە هەموی عیبادەتە. بەڵام بەو مەرجەی بەو پەڕی دڵخۆشی‌و ئیخلاصەوە ئەو عیبادەتانە بەجێبهێنێت بەواتایەکی تر عیبادەت واتە گوێڕایەڵی کردن‌و ئەنجامدانی فەرمانەکان جا ئەگەر ئەو گوێڕایەڵی کردنە بۆ خواو بۆ پێغەمبەرﷺ بو چاکە ئەگینا لەو بڕیارەی کەداومانە راستمان نەکردوەو ئەهلی شیرکین نە ئەهلی تەوحید چونکە پەیڕەوی هەرچی بکەیت ئەوشتەت پەرستوە، ئەوەتە لە سورەتی جاسیەدا دەفەرموێ: ﴿ئایا تۆ نەت دی ئەوکەسەی کەهەوەس‌و ئارەزۆی خۆی دەپەرست؟﴾ چونکە بەگوێی ئارەزۆکانی خۆی دەکات، جا ئەگەر ئامادەی ئەنجامدانی فەرمانەکانی خوا نەبوین مانای وایە کە درۆمان کردوەو بەندایەتی خوامان نەکردوە، بەڵکو بەندایەتی غەیری خوامان کردوە جا کە وتمان: خوایە تەنها بۆ تۆ عیبادەت دەکەین، خوای گەورە دەفەرموێ: نەخێر درۆ دەکەن، چونکە لە سورەتی ئەعرافدا پێی راگەیاندوین کە ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ/الأعراف:٥٤/ ئاگادار بن هەر ئەو دروستکەرەو هەر بۆ خۆیشێتی فەرمان دان﴾

دەی هەمومان دان بەوەدا دەنێین کە خوا خالیقە دەی چۆن دەبێت کە دروستکراو لەدروستکەر چاکتر خۆی بناسێت‌و یاساو بەرنامە بۆ خۆی دابنێت ئایا شتی ئاوەها ژیری وەری دەگرێت؟ کەواتە ئەوکەسەی کەدروستی کردوین دەبێ هەرئەو فەرمانمان بەسەردابدات کەسی تر مافی فەرماندانی نیە، هەرکەسێك خۆی بەشایستەی ئەوە بزانێت کە بۆی هەیە فەرمان دەربکات جگە لە فەرمانی خوا، مانای وایە ئەو کەسە داوای خوایەتی دەکات بەسەر خەڵکەوە بڵێ یان نەڵێ، فەرمانی کێش جێ بەجێکرا ئەوە پەرستراوو بەندایەتی بۆ کراوە چ خەڵك بزانن یان نەزانن. جا پێویستە ئێمەی موسڵمان‌و نوێژ کەر کە ئەم سوورەتە لای کەم حەڤدە جار رۆژانە لە نوێژدا دەیخوێنین‌و دەڵێین ئێمە تەنها بەندایەتی بۆ تۆ دەکەین هەروەها لە باقی ئەمرو فەرمانەکانی خوا دەرنەچین‌و بەگوێرەی توانا ئەنجامیان بدەین.

بەڵێ ئێمە تاکو ئێرە سوپاس‌و سەنای خوامان کردوەو بەڵێنمان داو وتمان تەنها بەندایەتی بۆ خوا دەکەین، ئینجا دەڵێین: ﴿وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ دەی داوای یارمەتیش هەر لە تۆ دەکەین، چونکە هەر خوایە یارمەتیمان دەدات. مرۆڤی موسڵمان ئەگەر وای زانی کە کەسێکی تر یارمەتی دەدات‌و کۆمەکی دەکات‌و خۆی توانای هەیە بە بێ فەرمان‌و دەسەڵاتی خوا ئەو ئیشە بکات، بە راستی ئەو ئینسانە بە هەڵە دا چووە، وەتێ نەگەیشتوە لە بیرو باوەری خۆی، ئەبێ تەوبە بکات‌و بڵێ: تەنها خوای گەورەیە دەتوانێ قازانج‌و زیانم پێ بگەیەنێ . وەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ:{یَا غُلَامُ إني أَعَلِّمُكَ كَلِمَاتٍ احْفَظِ اللَّهَ يَحْفَظْكَ احْفَظِ اللَّهَ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ إِذَا سَأَلْتَ فَاسْأَلِ اللَّهَ وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللَّهِ وَاعْلَمْ أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ لَكَ وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلَّا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَيْكَ رُفِعَتْ الأَقْلَامُ وَجَفَّتِ الصُّحُفُ /الترمذي، صححه الالبا / ئەی لاو بێگومان چەند رستەیەکت فێردەکەم کە بەسود بێ بۆت، بڕیارو سنورەکانی خوا بپارێزە خوایش دەت پارێزێت، پارێزەری فەرمانی خوا بە هەمیشە لەگەڵت دایەو دەتپارێزێت، هەرکاتێك داوات کرد جا هەر لە خوا داوا بکە، وە هەرکاتێك کە یارمەتیت

ویست ئەوسا داوای یارمەتی هەر لە خوا بکە، بزانە ئەگەر ئەم گەلە هەمو کۆ ببنەوە لەسەر ئەوەی کە قازانجێکت پێبگەیەنن ناتوانن مەگەر خوا بڕیاری دابێت کە ئەو قازانجەت پێ بگات، وە هەموشیان کۆ ببنەوە لەسەر ئەوەی کەوا زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن هیچ زیانێکت پێ بگەیەنن، مەگەر خوا بڕیاری دابێت ئەو زیانەت پێ بگات} کەوابو خەڵکی تر بو بە چی؟ هیچ.

پێویستە ئەوەش بزانین کەداواکردن دووبەشە یەکەم ـ داواکردنی شتێك لەکەسێك کە ئەگەر ڕێگرێك نەبێت بتوانێت بێت بەدەمتەوەو ئەو ئیشەش لەتوانای مرۆڤدا بێت وەك ئەوە بە کابرایەك بڵێیت: یارمەتیم بدە با ئەم بارە باربکەین ئەوە داوایەکی ڕەوایە. دووهەم: داواکردنی شتێك لەکەسێك کە ئەگەر ڕێگریش نەبێ نەتوانێت بێت بەدەمتەوە وەك داواکردن لە دارو درەختو مردوو یان داوای یارمەتی لەسەر شتانێك ئەنجامدانی ئەو ئیشە لە توانای مرۆڤدا نەبێت وەك منداڵ پێدان و ڕەشکردنەوەی تاوانو شیفادانی نەخۆش کە ئەوجۆرە داوایانە ڕەوانیەو شیرکەو تاوانێکە بەبێ تەوبەکردن خوا چاوپۆشی لێ ناکاتودەبێ باوەڕدار خۆی لەوانە بپارێزێت.

ئەم سورەتە بەنرخە کراوە بەدووبەشەوە، بەشی یەکەمی بەندایەتی ئێمەیە بۆ خواوبە ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾ کۆتای دێت. بەشی دووهەمی داوای ئێمەیە لە خوای گەورەکە لە ﴿ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ﴾ وە دەست پێ دەکات کە داوای لێدەکەین کە یارمەتیمان بدات. بزانە کە نەوتراوە (إياكَ أعْبُدُ )وە ( إياكَ أستَعِيُ ) واتە بەتاك نەهاتوە، واتە ناڵێیت: من هەرتۆ دەپەرستم، وە من داوای یارمەتی هەرلە تۆ دەکەم. هەندێك پێیان وایە، چونکە مرۆڤ لەمەقامێکی گەورە دایە کە بەرامبەر بە خوا وەستاوە لەبەر ئەوە خۆی بە گەورە دەگرێت، بۆیە ماوەی پێدراوە کە ئەودوو وشەیە بەکار بێنێ کە بە (نون)ی قسەکەرە بەخۆیەوە ﴿ نَعۡبُدُ ... نَسۡتَعِينُ ﴾ بەڵام لەراستی دا من وای بۆ دەچم: چونکە ئیسلام ئاینی کۆمەڵەو ئاینی یەکێتیو برایەتیە تێمان دەگەیەنێ تاکێك کە تەنها هەر بۆخۆی بێتو هیچ پەیوەندی بەکەسەوە نەبێت لەم ئاینەدا نامۆیە بەڵکو بە کۆمەڵ شتە، وەکو پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ:{فَمَنْ رَأَيْتُمُوهُ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ أَوْ يُرِيدُ يُفَرِّقُ أَمْرَ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ ﷺكَائِنًا مَنْ كَانَ فَاقْتُلُوهُ فَإِنَّ يَدَ اللهِ عَلَى الْجَمَاعَةِ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ مَنْ فَارَقَ الْجَمَاعَةَ يَرْكُضُ /الترمذی، النسائی، صححه الالبا / جاهەر کەسێکتان دی کە خۆی لە موسڵمانان جیادەکردەوە یان دەی ویست کە ئەم ئومەتی محمدەﷺ لەت بکات هەر کەسێك بێت بیکوژن سادڵنیابن کە دەستی خوا لەگەل کۆمەڵی موسڵماناندایە، ئینجا بێشك کەشەیتان لەگەڵ ئەوکەسەی کە لە موسڵمانان جیا دەبێتەوە هەڵپەڕکە دەکات } هەروەهاپێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ /الترمذی، صححه الالبا / پێویستە لەسەرتان کە ئێوە یەك بنونەخەڵەتابن بەشبەش ببن} وە لە سورەتی ئالی عمراندا ﷻدەفەرموێ:﴿ وَٱعۡتَصِمُواْ بِحَبۡلِ ٱللَّهِ جَمِيعٗا وَلَا تَفَرَّقُواْ / آل عمران: ١٠٣/ هەموتان دەست بگرن بە ئاینەکەی خوداوەو بەش بەش مەبن﴾ کەوابو ئێمە کاتێك موسڵمانین کە یەك دەستو یەك ڕیز بین چونکە بەبێگومان نیوەی ئاینو عیبادەتمان کۆمەڵایەتییەو بەتاك ناکرێت، بۆ نمونە: تۆ زکات بە کێ دەدەی؟ بەکێ دەڵێیت چاکە بکەو خراپە مەکە؟ کەوابو ئیسلام ئاینی کۆمەڵەو ﴿نَعۡبُدُ ... نَسۡتَعِينُ ﴾ تێمان دەگەیەنێت کە دەبێ بە یەکپارچەییو یەك ڕیزی بژین کەواتە تۆ کاتێ ئەم سورەتە لە نوێژ دا دەخوێنیت وەك نمایندەیەکی موسڵمانان لەگەل خوادا گفتوگۆ دەکەیتو بڕیارێکی زۆر گەورەش دەدەیت، چونکە بڕیارت داوە کە هەر ئەو دەپەرستین و هەر لەویش داوای یارمەتی دەکەینو یەکپارچەو یەکریزینو بڕیاری یەکێکمان بۆ هەمومانە جا تۆ هەر کە دیتت کابرایەك لە شوێنێکدا نوێژ دەکات دەزانی کە ئەوەدوعا بۆ تۆ دەکاتو بە ناوی تۆوە دەپاڕێتەوە لە خوا، واتە بۆ خۆیو بۆ تۆش دەپاڕێتەوە جادەبێ تۆش ئەو کابرایەت خۆش بوێت کە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەموسڵمانان زیاتر یەکتریان خۆش بوێت، چونکە مرۆڤی موسوڵمان لە ڕۆژێکدا بە لای کەمەوە حەڤدە ركات نوێژ دەکات، واتە حەڤدە جار دەپاڕێتەوەو دوعا دەکات بۆ خۆیو بۆ گشت موسڵمانێك جا ئیتر چۆن دەبێ موسڵمانان یەکتریان خۆش نەوێت؟ بەڵکو خۆشویستنی موسڵمان مەرجی باوەڕداربونە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: { وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ./متفق علیه/ سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە تا باوەڕنەهێنن، جا

باوەڕی ڕاستیشتان نیە هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئەوە بۆ ڕێنماییتان نەکەم بۆ کردارێك هەرکاتێك ئەوکردارە ئەنجام بدەن یەکترتان خۆش بوێت؟ لەنێوخۆتاندا زۆر سەلام بکەن}

ئایا دەزانیت کە برای دینیت بە لای کەمەوە ڕۆژێ حەڤدە جار دوعات بۆ دەکات وە دەپاڕێتەوە لە ﷲ کە کۆمەکیمان بکات و یارمەتیمان بدات؟ هەر لەسەر ئەو بناغەیە کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتىَ يُحِب لِأَخِيهِ مَا يُحِب لِنَفْسِهِ /منفق عليه/ هیچ کام لە ئێوە ئیمانتان تەواو نیە هەتا ئەوەی کە بۆ خۆتان پێخۆشە هەر ئەوەشتان پێ خۆش بێت بۆ برای دینی خۆتان} هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ هەرلەم بارەیەوە دەفەرموێ:{تَرَى الْمُؤْمِنِ فِي تَرَاحُمِهِمْ وَتَوَادِهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ كَمَثَلِ الْجَسَدِ إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسهَرِ وَالْحُمى /منفق عليه/ تۆ دەبینی باوەڕداران لەسۆزو میهرەبانیو یەکویستنو بادانەوەیان بۆلای یەکتر وەك یەك لەشن جاهەرکاتێ پارچەیەکی هاتە ژان هەمو ئەندامەکانی لەش دێنە ژانو ئیسراحەت ناکەن تا ئەو پارچەیە سارێژ نەبێت } واتە ئێمەی موسڵمان ئەگەر ئاوەها نەبین ڕاستمان نەکردوە، کەوا بو ﴿نَعْبُدُ ... نَسْتَعِينُ﴾ تێیگەیاندین کە ئێمەی موسڵمان یەك کۆمەڵینو یەك لەشینو بەو شێوەیە شتین ئەگینا بەتەنیا هیچ نینوهیچ ئیشێکی گرنگی ئیسلامیشمان پێ ئەنجام نادرێت هەرچەند فویش لە خۆمان بکەین. دیارە تێکەڵ بون لە گەل موسڵمانانو هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا شتێکی ئاسان نییە چونکە کۆمەڵگە هەموی وەك یەك نیە جا ئەمە خۆ گریو حیکمەتی دەوێ، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُ إِذَا كَانَ مُخَالِطًا الناسَ وَيَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ خَيْرٌ مِنَ الْمُسْلِمِ الذِي لَا يُخَالِطُ الناسَ وَلَا يَصْبِرُ عَلَى أَذَاهُمْ /الترمذي، ابن ماجة، صححه الألبا / ئەو موسڵمانەی کە تێکەڵاوی خەڵك دەبێتو خۆی دەگرێت لەسەر ئێشو ئازارەکانیان باشترەلەو موسڵمانەی کە تێکەڵاوی خەڵك نابێت وخۆی ناگرێت لەسەر ئێشو ئازارەکانیان}

کەوا بو ئاینی ئیسلام ئاینی یەکێتیوبرایەتیو خۆشەویستی ویەکڕیزیە، کاتێ کە دەڵێیت: ﴿خوایە ئێمە تەنها تۆ دەپەرستینو تەنها داوای یارمەتیش لە تۆ دەکەین﴾ تۆ بە ناوی هەمو موسڵمانانەوە قسە دەکەی، کەواتە هەمو موسڵمانێك پێویستە ئەم ڕاستیانە بۆ خۆی بزانێت وهەوڵدات کە ئەو مانایە لە ناو خەڵکداو لەدەروەوەی نوێژەکەیدا بچەسپێنێت تا زیاتر خۆشەویستی بکەوێتە ناو دڵەکانەوە. دیارە ئەگەر کەسێك خۆشویست ئیتر حەز بە زیانی ناکەیت، ماڵی بەناحەق ناخۆیت، غەیبەتی ناکەیتو درۆی بۆ هەڵناوەسێتو سیخوڕی لەسەر ناکەیت بۆیە پێویستە لەسەرمان کە نوێژ پاکمان بکاتەوە لەهەمو کردارو گوفتارو نیەتێکی خراپ ئەگینا نوێژمان نەکردوە.

لە فەرمودەیەکی قودسی دا ئەم سورەتە بە (الصلاة) ناوبراوە کە دەفەرموێ:{قَالَ اللَّهُ تَعَالَى قَسَمْتُ الصلاةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ فَإِذَا قَالَ الْعَبْدُ ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى حَمِدَنِي عَبْدِي وَإِذَا قَالَ ﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى أَثْنَى عَلَي عَبْدِي وَإِذَا قَالَ ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ قَالَ مَجدَنِي عَبْدِي وَقَالَ مَرةً فَوضَ إِلَي عَبْدِي فَإِذَا قَالَ ﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ قَالَ هَذَا بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ فَإِذَا قَالَ ﴿ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ قَالَ هَذَا لِعَبْدِي وَلِعَبْدِي مَا سَأَلَ /مسلم وغ ٥/ ﷲ فەرمویەتی: سورەتی فاتیحەم کردوە بە دوو بەشەوە لەنێوان خۆمو بەندەکەمدا، وە بەندەکەم چی داوا بکات پێی دەدرێت جا کاتێك کە دەڵێت: ﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ﴾ ﷲ دەفەرموێ: عەبدەکەم سوپاسی منی کرد، وە کاتێك دەڵێت:﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ ﷲ دەفەرموێ: بە چاکە وەسفی کردم، وەکاتێك دەڵێت: ﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ﴾ ﷲ دەفەرموێ: بە گەورەیو بەرزی یادی کردم وجارێکیش واهاتوەکە فەرموی: عەبدەکەم دەسەڵاتداریەتی ئەوڕۆژەی بەمن سپارد، جا کاتێك وتی:﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ﴾ دەفەرموێ: ئەمە نێوانی منو بەندەمە جا چی داوا بکات پێی دەدرێت، جا کاتێك وتی: ﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ﴾ ﷲ دەفەرموێ: ئەمە بۆ عەبدەکەمە جا چی داوا بکات پێی دەدرێت. ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ...

(٦) ڕێنماییمان بکە بۆ ڕێگای ڕاست.

واتە هەم ڕێگای ڕاستمان پیشان بدەو حەقو ناحەقمان بۆ دەربخە و هەم لەسەر ئەو ڕێگایە سەقامگیرمان بکەو یارمەتی مان بدە کە لێی لانەدەین، دیارە ڕێگا زۆرە بەڵام تەنها یەك ڕێگا ڕاستە وڕێگاکانی تر هەمویان کوێرەڕێگانو زۆر نابات ڕێبوارانیان یان

هەڵدەدێرێن یان بەبێ ڕاهەدەگەن‌و جگە لە گەڕانەوە چارەیەکی تریان نیە. ئەی ڕێگای ڕاست کامەیە؟

(٧) ڕێگای ڕاست ڕێگای ئەو کەسانەیە کە نیعمەتی خۆتت ڕژاندوە بە سەریاندا کە ئاینی ئیسلامەو گەورەترین نیعمەتی خوایە نەك ڕێگای ئەو غەزەب لێگیراوان‌و گومڕایانە.

جا ئێمەش داوا دەکەین کە لەسەر ئەو ئاینە پیرۆزە بژین‌و لەسەر ئەو بمرین‌و هاوڕێ‌و ڕەفیقی هەڵگرانی ئەو ئاینە بین ئەوانەی کە نیعمەتت ڕژاندوە بە سەریاندا کە پێغەمبەران و پیاو چاکان‌و ساڵحان‌و شەهیدانن کەئەوانە هەمویان بەو نیعمەتەی خوا بون بەو مرۆڤە بەنرخ‌و پایەبەرزانە. ئینجا هەروەکو داوای ڕێنمایی‌و پیشاندانی ڕێی حەقمان لێکرد هەروایشە داوای لێدەکەین کە ڕێگای هەڵەڕۆی‌و سەرلێشواییمان بۆ ڕون بکاتەوەو بمانپارێزێ لێی، بەڕاستی حەق‌و ئیمان بەتەواوی بۆ ئیسان ڕون نابێتەوە تا نەزانێت ناحەق‌و کوفر چییە، وە ئەوەی کوفرو گومڕاهی نەناسی زۆر نزیکە توشی ببێت بە بێ ئەوەی کە ئاگای لە خۆی بێت،

عومەری کوڕی خەتاب ﷺ دەفەرموێ: (إنما تنقض عُرى الإسلام عُروَةً عروَةً إذا نَشأ في الإسلامِ مَن لا يَعرف الجاهلية / بەڕاستی لقوپۆی ئیسلام یەك لەدوای یەك لەناو دەچێت هەرکاتێ کەسێ کە هەر لە ناوی ئیسلام دا گەشەی کردبێت‌و کوفرو نەزانی نەناسێت)

وا ئەمڕۆ دەبینین ئەو قسەیەی بەدی هاتوە، کابرا خۆی بە موسڵمان دەزانێت کەچی هاوار لە غەیری اللّٰه دەکات، ئەوەی تر دەڵێ باوەڕم بەقورئان هەیە بەڵام لە هەمان کاتدا یاسای دستکردی بۆ ژیانی هەڵبژاردوە، ئەوی تر خۆی بە شوێنکەوتەی سونەتی پێغەمبەر ﷺ دەزانێت کەچی لاسایی گاورو جولەکە دەکاتەوە!! خوا بمانپارێزێت، بەڕاستی هەر ئەو زاتە دەتوانێ ڕێ پیشاندەر بێت‌و بمانپارێزێ بۆیە دەڵێین: سا خوایە دورمان بخەرەوە لەو غەزەب لێگیراوانە ئەوانەی کە لایان داوە لە ڕێگای ڕاست کە جولەکە سەرقافڵەیانەو ئەوانەش کەگومڕابون کەگاوریش سەرقافڵەی ئەوانە.

جابۆیە نوێژ خوێن پاش تەواوبونی ئەم سورەتە سونەتە بڵێت: (امین) واتە خوایە ئەم دوعاونزاو عیبادەتەم لێوەرگرە. جا ئەگەر بە جەماعەت لە پشت ئیمامێك نوێژی دەخوێنێ هەوڵدات با ئامینەکەی لەگەڵ ئامینی ئیمامدابێت چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:{إِذَا أَمَّنَ الْإِمَامُ فَأَمِّنُوا فَإِنَّهُ مَنْ وَافَقَ تَأْمِينُهُ تَأْمِينَ الْمَلَائِكَةِ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ /متفق علیه/ هەرکاتێ کە ئیمام ئامینی کرد ئەوکاتە ئێوەش ئامین بکەن جا بێگومان هەرکەسێك ئامینەکەی ڕێك بکەوێت لەگەڵ ئامینی فریشتەکاندا ـ چونکە ئەوان لەگەڵ ئیمامدا ئامین دەکەن ـ چاوپۆشی دەکرێت لەگوناهی پێشوی}

جا ئێمەی موسڵمان پێویستە لەم ئاینە شارەزابین‌و قورئان بزانین چونکە ئێمە بۆ ئەوە دروست بوین، پاش تاقی کردنەوەمان دەمرین‌و جارێکی تر ناگەڕێینەوە بۆ ئیشکردن، جا ئاگات لەخۆبێ‌و چاکی بزانە، لەبەردەمتایە سەنگ‌و کێشانە، هاتنی دنیات بۆ ئیمتحانە، هەتا لەودنیا نەتبێ بەهانە.

لەم سورەتە کورتەی قورئاندا لە سەرەتاوە هات، ناوی خواو هەموو سیفەتەکانی بە وشەکانی ﴿ اللّٰه ، الرَّحْمَٰنِ ، الرَّحِيمِ ، رَبِّ الْعَالَمِينَ ، مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ ﴾ پێ ناساندین لەڕاستیدا ئەم پێنج ناوانەی پەروەردگار ئەگەر بەوردی تەماشا بکرێن تەواوی ناوو سیفەتەکانی خوا دەگرێتەوە، هەروەها هەرسێ بەشەکەی تەوحیدی بە تەواوی لەخۆگرتوە تەوحیدی زات‌و سیفات‌وکردار جا ئەوەی کە ئیمانی بە ڕۆژی دوای هەبێ‌و بزانێ کە حیسابێك هەیە خۆدەبێ باوەڕی بەم پەراوە هەبێ‌و ئەم پەراوەش لە ڕێگای پێغەمبەرەوە هاتوە لێرە دەبێ باوەڕی بە گشت پێغەمبەران هەبێت کە دواهێنەری هەمویان پێغەمبەرمانە ﷺ هەروەها ئەم سورەتە تێی گەیاندین دەبێ بەندایەتیەکەمان پاڵفتە بێت، چونکە بەندایەتی ئەگەر پاڵفتە نەبێت خوا وەری ناگرێت، وە شەیتانیش دەتوانێ فریومان بدات چونکە کاتێ کە نەعلەتی لێکرا وتی: ﴿سوێندم بە عزەتت هەمویان گومڕا دەکەم، مەگەر ئەو بەندانەت کە خۆیان پاڵفتەویەکلا کردوەتەوە بۆبەندایەتیت﴾ ص ٨٣،٨٢:

جا بۆ ئەوەی کە پارێزراو بین لە شەڕی شەیتان‌و شەیتان سیفەتان پێویستە ئینسان ئیشەکانی بە پاکی‌و بەدڵسۆزی بۆ خوا ئەنجام بدات‌و تێکەڵاو بەڕوپامایی‌و ڕیایی نەبێت هەروەها تێی گەیاندین کە کام ڕێگا ڕێگای بەختەوەریە، وە کام ڕێگا ڕێگای گومڕاهیە، وە پێویستە ئەوەش بزانین کەئێمە توانای هیچ شتێکمان نیەو دەبێ هەموی بسپێرین بە اللّٰه، وە تەنها لەو داوا ی کۆمەك بکەین چونکە ﴿ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ﴾ /الطلاق: ٣/ هەرکەس پشت بە خوا ببەستێ ئەوسا ئیترخوا بەسیەتی ﴾ واتە بەو جۆرە خواناسیە سەرکەوت‌و بەختەوەر دەبین.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى
لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ
وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ٣ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ
إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ وَبِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ٤
أُوْلَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدٗى مِّن رَّبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ
هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥

## ٢ سورەتی بەقەرە ٢٨٦

سورەتی بەقەرە کە سورەتی دووهەمی قورئانەو دووسەدو هەشتاوشەش ئایەتە، لە سەرەتای هیجرەتی پێغەمبەرەوە ﷺبۆ مەدینە پاش سورەتی موتەففین دابەزیوە، جا بەردەوام ئایەتەکانی ئەم سورەتە دەهاتنەخوارەوەو تا دوایین ئایەت کە دابەزیوە سەر پێغەمبەرﷺ کە ئایەتەکانی ریبایە کە هی ئەم سورەتەیە، ئەم سورەتە یەکێکە لە درێژترین سورەتەکانی قورئان کە زۆربەی زانایان ماندو بونیان کێشاوە بۆ لەبەرکردنی، چونکە ئەم سورەتە نیشانەی عیلمو تێگەیشتنە، وەك دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ رۆژێکیان کۆمەڵێك مرۆڤی هەڵبژاردو دەیویست بۆ ئیشێکیان بنێرێ چەند پرسیاری قورئانی لێ کردن فەرموی: کێ چی لەبەرە؟ دەستیان کرد بە قورئان خوێندن هەر کەسێك شتێکی خوێند تاکو گەیشتە کەسی کۆتاییان کە کەسێکی تەمەن منداڵیان بو پرسیاری لێ کرد: چیت لە بەرە لە قورئان؟ منالەکەش وتی: فلان سورەتو فلان سورەت لەگەڵ سورەتی بەقەرەدا، ئینجا کە ئەمەی وت، فەرموی: سورەتی بەقەرەت لە بەرە؟ فەرموی: جا تۆ ئەمیری ئەم کۆمەڵە بە، هەرچەندە بە تەمەن منالٚ بو بەلاٚم بەهۆی ئەوەی کە سورەتی بەقەرەی لە بەر بو، ئەو بوو بە ئەمیری ئەو کۆمەڵە موسڵمانە، ئەمە رۆشنترین بەڵگەیە لەسەر پلەو مەقامی ئەم سوورەتە، وە ئەبوهورەیرە (خوای لێی رازی بێت) دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺفەرموی: {لَا تَجْعَلُوا بُيُوتَكُمْ مَقَابِرَ إِنَّ الشَّيْطَانَ يَنْفِرُ مِنَ الْبَيْتِ الَّذِي تُقْرَأُ فِيهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ/مسلم/ ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان بەراستی شەیتان رادەکات لە ماڵێك کە سورەتی بەقەرەی تێدا بخوێنرێت}وە دەفەرموێ:{إن لِكُلِّ شيءٍ سناماً، وإن سنامَ القُرآنِ البَقَرة /ا اكم، حسنه الالبا / هەموشتێك لوتەکەی بەرزی خۆی هەیە، لوتەکەی بەرزی قورئانیش سورەتی بەقەرەیە}

وەهەروەها پێغەمبەر ﷺ سورەتی "بەقەرە" و سورەتی "ئالی عیمران"ی بە " الزَّهْرَاوَيْنِ" ناو دەباتو دەفەرموێ: {اقْرَءُوا الْقُرْآنَ فَإِنَّهُ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ شَفِيعًا لِأَصْحَابِهِ اقْرَءُوا الزَّهْرَاوَيْنِ الْبَقَرَةَ وَسُورَةَ آلِ عِمْرَانَ فَإِنَّهُمَا تَأْتِيَانِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كَأَنَّهُمَا غَمَامَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا غَيَايَتَانِ أَوْ كَأَنَّهُمَا فِرْقَانِ مِنْ طَيْرٍ صَوَافَّ تُحَاجَّانِ عَنْ أَصْحَابِهِمَا اقْرَءُوا سُورَةَ الْبَقَرَةِ فَإِنَّ أَخْذَهَا بَرَكَةٌ وَتَرْكَهَا حَسْرَةٌ وَلَا تَسْتَطِيعُهَا الْبَطَلَةُ /مسلم وغ ه/ قورئان بخوێنن کە بەراستی رۆژی قیامەت دەبێت بە تکاکارو شەفاعەتکار بۆ یارەکانی، ئەو دوو گوڵەی قورئان، بەقەرەو ئالی عیمران بخوێنن، جا بەراستی رۆژی قیامەت ئەو دوانە دێن وەك دوو پەڵە هەور یان وەك دوو سێبەر یان دوو کۆمەڵە لە باڵندە کە باڵەکانیان کردوەتەوە، پشتگیریو یارمەتی هاوڕێکانیان دەکەن، سورەتی بەقەرە بخوێنن کە بەراستی وەرگرتنی بەرەکەتەو وازلێهێنانی پەشیمانیەو ساحیران ناتوانن لە بەرامبەریدا رابوەستن}

زانایان ئەوەندە خۆیان بە سورەتی "بەقەرە"وە خەریك کردوە هەتا زانیویانە کەچەند وشەو چەند پیتو چەند فەرمانی تێدایە، هەندێك وتویانە لەم سورەتەدا هەزار هەواڵو هەزار ئەمرو هەزار نەهی تێدایە، درێژترین ئایەتی قورئان لەم سورەتەدا هاتوە، کە ئایەتی دووسەدو هەشتاو دووە. ئەم سورەتە پێشەکی مرۆڤی کردوە بە سێ بەشەوە: باوەڕدارو بێ باوەڕو و مونافق، لەم سێ لایەنەوە باسی مرۆڤەکان دەکات، باسی ئیمانداران دەکات، ئینجا سیفەتەکانیان ودوا رۆژیان، وەهەروەها باسی بێ باوەڕان دەکات لەگەڵ سیفەتەکانیانو دوا رۆژیان، جا باسی مونافقانو سیفەتەکانیانو دوا رۆژیان دەکات، وە هەروەها ئەم سورەتە لە بارەی ئەحکامەوە، ئەحکامێکی زۆری تێدایە، ئەگەر بە وردی تەماشای بکەین عیلم و زانستێکی زۆری تێدایە، ئەبو ئومامە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {اسْمُ اللهِ الأَعْظَمُ الذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ فِي سُوَرٍ ثَلاثٍ الْبَقَرَةِ وَآلِ عِمْرَانَ وَطه/ ابن ماجه، صححه الالباني/ ئەو ناوەگەورانەی خوا کە هەرکاتێ بەوناوانە داوای لێ بکرێت وەلاٚم دەداتەوە لەم سێ سورەتەدا هاتوە "بەقەرەو ئالی عیمرانو تەها}

﴿ بەناوی اللهٰ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان ﴾

(١) سەرەتای ئەم سوورەتە بەم وشانە دەست پێ دەکات، کە بەم شێوەیە دەخوێنرێتەوە (ئەلیف،لام،میم). ئەم وشانە، چونکە سەربەخۆن بە ناوەکانیان دەخوێنرێنەوە پێیان دەوترێت (ا روف مقطعة) واتە پیتە جیاکان، کە چواردە پیتنو لە سەرەتای بیستو نۆ سورەتی قورئان دا هاتوون، بەشێك لە زانایانی تەفسیر لەسەر مانای ئەم پیتانە قسەیان کردووەو زۆر شتیان باس کردوە، بۆ نمونە هەندێك وتویانە: کە (الف) بە واتای اللهٰ یە، (لام) جبرائیل، وە (میم) محمدە ﷺ. هەندێکی تریان دەڵێن: وشەیەکە بۆ ئاگادار کردنەوە، وە چەندین رای تریش هەیە، بەلاٚم ئەمانە هەمویان راو بۆچونەو هیچ کامیان سەنەدێکی راستو دروستیان لەسەر نییە. زۆربەی زانایان پێیان وایە کە ئەمە موتەشابیهەو واتاکەی نەزانراوە کە ئەمە پەسەندترین رێگایە بۆ خۆپاراستن لە چونەناو موتەشابیهاتەوەو خۆ دورگرتنە لە بریاردان لەسەر قورئان بە بێ بەڵگە، بەلاٚم لە هەمان کاتدا باوەڕمان وایە کە پەروەردگار بێهودە ئەمەی رەوانە نەکردوە، بەڵکو لە روی حیکمەتو زانیاییەوە بوە.

کاتێك کە لە سورەتی ئەعرافدا کە بە ﴿ الٓمٓصٓ ﴾ دەست پێدەکات دەبینین کە وشەی ﴿ بَسۡطَةٗ ﴾ کە لە ئەصڵدا بە (سین)ە بە ﴿بَصۜطَةٗ ﴾الأعراف: ٦٩ واتە (صاد) نوسراوە ئاماژەیەکە بۆ ئەوەی کە سەرنجی باوەڕدار رابکێشێت بۆ ئەم پیتەو پیتەکانی دیکە کە بە شێوەی جیاجیا لە سەرەتای سورەتەکە هاتون، یان هەروەك دەبینین لە هەموی قورئان کاتێك کە باسی گەلی لوت دەکات بە ﴿قَوۡمُ لُوطٖ ﴾ ناویان دەبات، بەڵام لە سورەتی قاف کە بە ﴿قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ﴾ دەست پێدەکات گەلەکەی لوت بە ﴿وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ﴾ ناودەبات، کە ئەمەش بەراستی سرنج راکێشە.

یەکێك لە موعجیزە سەرسوڕ هێنەرانەکانە سەبارەت بەم پیتانە ئەوەیە ژمارەی دوو پات بونەوەی هەرکام لەم پیتانە لە سورەتەکانیان دا لە سەر نۆزدە بە بێ ماوە دابەش دەکرێن واتە لێدراوێکن لە ژمارەی نۆزدە، وە هەر خواش زاناترە. ئەمە بزانە بۆ تەواوی ئەو پیتانەی کە لەسەرەتای هەندێك لەسورەتەکانی قورئانەوە هاتون.

(٢) ئەم کتێبە بەرزو بەنرخە لەراستیو تەواوی دا هیچ گومانێك تێدا نیە بەڵکو هەمو زانیاریو علمێکی تەواوو راستەو رێپیشاندەرە بۆ پارێزکاران.

وشەی ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ واتە ئەوە، ئیشارتێکە بۆ دور بەڵام ئەگەر بۆشتکی نزیك بەکارچو ئەوە مانای گەورەیو رێز دەگەیەنێت وەك لێرەدا لەباتی ئەوەی کە (هذا) بەکاربێنێت بڵێت ئەم کتێبە وتراوە ﴿ ذَٰلِكَ ﴾ ئەو کتێبە.

جارێکیان ئیمامی عومەر- خوالێی رازی بێت - پرسیاری کرد لە ئوبەیەی کوڕی کەعب، کە تەقوا چیە؟ وتی: ئەگەر بڕۆی بە ناو شوێنێکدا کەهەموی دڕكو داڵ بێت چی دەکەی؟ فەرموی: جل وبەرگەکەم هەڵ دەکەمو خۆمی لێ دەپارێزم، وە زۆر بە وریاییەوە دەڕۆم تا لێی تێدەپەڕم، وتی: ئەوە تەقوایە، واتە: وریای خۆت بەو خۆت بپارێزە لە گوناحو خۆت تاوانبار نەکەیت.

لە ئیمای عەلیەوە هاتوە کە لەبارەی تەقواوە پرسیاری لێکرا جا وتویەتی: {هِيَ الْخَوفُ مِن الْجَلِيل وَالعَملُ بِالتَّنزيلِ وَالقَناعةُ بِالقليل والإستِعدادُ لِيومِ الرحيل/ تەقوا ترسان لە خاوەن شکۆو ئیش کردن بەقورئانو رازی بون بەکەمو خۆ حازر کردن بۆ مردنە}

لەم ئایەتەدا بۆچی فەرموی بۆ موتەقیان خۆ ئەم قورئانە رێپیشاندەرە بۆ هەمو خەڵك؟ چونکە تەنها مرۆڤی لە خوا ترس سودی لێ وەردەگرێو دەگاتە پلەی خۆشبەختیو کامەرانی هەردوو ژیان وەك ئەوەی کەهەر بۆئەوهاتبێ وایە، جا بۆ بێباوەڕانیش دەبێت بە هۆی نەمانی بیانویان لە رۆژی قیامەتدا.

ئینجا وەسفی پارێزکاران دەکات و دەفەرموێ:

(٣) موتەقی کەسانێکن کەباوەڕیان بە هەمو ئەو شتە نهێنیانە هەیە کە خواو پێغەمبەرەکەی باسیان کردوە، وە بەڕێك و پێکی نوێژەکانیان ئەنجام دەدەنو بەردەوامن لەسەریانو لەوەی کە پێمان داون دەیبەخشن.

مەبەست لە شتە نهێنیەکان لە سەروی هەموویانەوە زاتی خوا خۆیەتیو لە پاش ئەو قیامەتو زیندوو بونەوەو حەشرو پردی سیراتو ئاگری جەهەنەمو بەهەشتو فریشتەکانە کەئەوانە هەمویان غەیبنو لەبەرچاومان نین، تەنانەت پێغەمبەریش ﷺ ئێستا بۆ ئێمە غەیبە، بەڵام بۆ سەحابەکان غەیب نەبو، هەر لەسەر ئەوەیکە پێغەمبەری خوا ﷺ بەیارەکانی دەفەرموێ: {وَدِدْتُ أني لقيتُ إخْوَانِي فَقالَ أصحَابُهُ أَوَليسَ نَحنُ إخْوَانَكَ قالَ أَنْتُمْ أَصْحَابِي وَلكن إِخْوَانِي الذِينَ آمَنُوا بِي وَلَمْ يَرَو / أ د وغ ه، صحح الألبا / ئاواتە خوازم کەبە براکانم بگەم، یارەکانی وتیان: ئەی ئێمە برای تۆ نیین، فەرموی: ئێوە رەفیقو یاری منن، بەڵام براکانم ئەو کەسانەن کە لە دوای ئێوە دێنو ئیمانم پێ دێنن، لەحاڵێکدا کە ئەوان منیان نەدیوە}

وشەی ﴿ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾لێرەدا بە تاك وتراوە نەك بەکۆ بەڵام (الـ) مانای کۆ دەگەیەنێت واتە هەمو نهێنیەك کە باسکراوە بۆیان، وە ئەو موتەقیانە کە باوەڕیان بە نهێنیەکان هەیە.

ئەو موتەقیانە نوێژەکانیان بەڕێكوپێکی دەکەن، کە بەو شێوەیە پەیوەندی بەینی خۆیانو خوای خۆیان دروست دەکەن، فەرموی ﴿ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾ وشەی (الإقامة) کە بەردەوامیش دەگەیەنێت واتە هەڵسان بەو شتەی کە نوێژ داوای دەکات، دیارە نوێژ داوا لە مرۆڤ دەکات، پێشەکی پاكو خاوێنی بیروباوەڕو جێگاو پۆشاكو پاكو خاوێنی لەش لەلەش پیسیو بێ دەست نوێژی، وە داوای لێ دەکات کەدڵو دەستو دەم پاك و دور لە هەمو خراپەو فەسادیەك بێت، وەك لە سورەتی عەنکەبوتدا دەفەرموێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ /العنكبوت: ٤٥/ نوێژ بە رێكو پێکی بخوێنە، بەراستی نوێژ بەرگری دەکات لە داوێن پیسیو خراپە﴾

وە دەبێ نوێژەکانی بە رێكو پێکی بکاتو بە رەوانی بیخوێنێتو بە سوجدەو رکوعێکی تێروتەواو، چونکە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {لَا تُجزئُ صَلَاةٌ لَا يُقِيمُ الرجُلُ فِيهَا صُلْبَهُ فِي الركُوعِ وَالسجُودِ/النّسائي، صحح الألبا / بێکەڵکە نوێژێك کە لە رکوعو سوجوددا پیاو پشتی راست نەکاتەوەو ئارام نەگرێت}و

تەحیاتێکی ڕێكو پێكو سەلام دانەوەیەکی جوان. ئەمە پێی دەوترێت (**إقامة الصلاة**) ئەگینا (**أداء**)ی صەلاتمان کردوە. ئینجا دەفەرموێ: وە لەوەی کە ئێمە پێمان داون دەبەخشن. وە ئەمە دوو بەشە: یەکەم ئەوەیە کە باوەڕدار پێی وایە هەرچی هەیە پەروەردگار پێی داوەو ئەمانەتێکە لای ئەو. بەشی دووهەمی ئەوەیە کە باوەڕدار لە وەی کە پێی دراوە کەسانی تر لەبیر نەکات، وە ئەمەش بۆ پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدایە. وە لە هەمو کردارێکی چاکدا پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوای گەورە هەیە چونکە ئەنجامدانی فەرمانێکی ئەو زاتەیە هەروەك لە نوێژدا ﴿ إِيَّاكَ نَعۡبُدُ ﴾ تێت دەگەیەنێ کە تۆ تەنها بۆ خۆت نیت، بەڵکو بۆخۆتو کۆمەڵی موسڵمانانیت،

جا پێویستە لێرەدا سرنج لە بەخشین بکەین، موسڵمانان با بزانن ئەوەی لەم سەر زەوییەدایە هەموی بەندەی خوداو ئەو رزقو رۆزیەش کە هەیە هەموی موڵکی خوایەو ئەودەیداتو بەئەندازەی پێویستی بەندەکانیشی رۆزی دەنێرێت، پاشان خوای گەورە لە بەر ئەو سودەی کە خۆی دەیزانێت هەندێك دەوڵەمەندو هەندێك هەژار دەکات، کە ئەمە هەردووکیان بۆ تاقی کردنەوەی هەردوو لایە، نە هەژاریو نە دەوڵەمەندی نیشانەی خۆشەویستی یان رق لێ بونەوەنیە، کابرای دەوڵەمەند دەبێ بزانێ ئەو شتەی کە پێێ دراوە هەرهی خۆی نیە، بەڵکو بەشێکی خەڵکی تێدایەو وەك ئەمانەتێکە لەلای ئەو، جا دەبێ بزانێت کە چی بەو سەرمایەی خۆی دەکاتو چۆن و چەند و بەکێی دەبەخشێت چونکە ئەو پرسیاری لێ دەکرێت وەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {**لَا تَزُولُ قَدَمَا الْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ حَتَى يُسْأَلَ، عَنْ أَرْبَعِ خِصَالٍ : عَنْ جَسَدِهِ فِيمَا أَبْلاهُ، وَعَنْ عُمُرِهِ فِيمَا أَفْنَاهُ، وَعَنْ مَالِهِ مِنْ أَيْنَ اكْتَسَبَهُ وَفِيمَا أَنْفَقَهُ**، /الط ا ،صحح الالبا / له رۆژی قیامەتدا بەندە لەشوێنی خۆی ناجوڵێت تا لەبارەی چوار شت پرسیاری لێ نەکەن: لەبارەی جەستەی کە لە چی دا لەناوی بردوە، لەبارەی عومری کە لەچیدا تەواوی کردوە، لەبارەی ماڵ وسامانیەوە کەلەکوێوە بەدستی هێناوەو لە چیدا بەکاری هێناوە}

هەروەها دەفەرموێ: {**تَصَدَّقُوا فَإِنَّهُ يَأْتِي عَلَيْكُمْ زَمَانٌ يَمْشِي الرَّجُلُ بِصَدَقَتِهِ فَلَا يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا يَقُولُ الرَّجُلُ لَوْ جِئْتَ بِهَا بِالْأَمْسِ لَقَبِلْتُهَا فَأَمَّا الْيَوْمَ فَلَا حَاجَةَ لِي بِهَا**/البخاري/ ماڵ ببەخشن جا بەراستی کاتێك دێت کە پیاو بەو ماڵەی کە دەیەوێت بیبەخشێت دەکەوێتە رێ بەڵام کەسێکی دەست ناکەوێت کەپێی بدات، جا پیاوو پێی دەڵێت ئەگەر دوێنێ بتهێنایا ئەوە وەرم دەگرت بەڵام ئەمرۆ پێویستم پێی نییە.}

هەروەها فەقیریش بۆ تاقی کرنەوەیە تا دەرکەوێت ئایا مرۆڤ لەو حاڵەتەدا ئارام دەگرێت یان نە. ئایا بۆ بەدەست هێنانی ماڵو سامان رو لە هەرشوێنێك دەکاتو هەر رێگەیەك لەبەردەگرێت بە بێ ئەوەی رەزامەندی ﷲ رەچاو بکاتو بزانێت ئایا ئەوە حەڵاڵە بۆی یان نە؟ ئینجا ئالێرەدا پێویستە موسڵمانان بزانن کە برای یەکترنو بزانن کە ئەگەر دەوڵەمەندنو لە بەشی خۆیان زیاتریان هەیە داوایان لێکراوە کە هەندێکی لێ بگەڕێننەوە بۆ ئەوانەی خوارەوەی خۆیان لە هەژاروکەم دەستان تەنانەت مێوانیش بەشی خۆی هەیە، جا ئەو کاتە ئێمە دەتوانین بە رێكو پێکی لەم دنیادا ژیان ببەینە سەر و ئەوکاتە هەرگیز فەقیر حەز ناکات کە ئەو دەوڵەمەندە زیانی لێ بکەوێت، خۆ ئەگەر چاوی لێ بو کە زیانێك روی تێبکات فەقیرەکە لە لایەن خۆیەوە ئەگەر لە دەستی بێت پارێزگاری لێ دەکات چونکە ئەوەی کە لەلای ئەو دەوڵەمەندەیە بەشی ئەویشی تێدایە وهیچ کەسیش حەز بە زیانی خۆی ناکات، جا بە پێچەوانەوە وەکو ئەمرۆ کە دەبینین دەوڵەمەند کە هەر بۆ خۆی کۆدەکاتەوەو لافی پێ لێ دەدات بە سەر خەڵکدا، هەژارەکەش نەك هەر بەو زیانە رازیە، بەڵکو حەز دەکات دە بەرامبەر زیان بکات، بۆ؟ چونکە دەڵێ راستە ماڵی خۆیەتی، بەڵام بەو ماڵە لوت بەرز بووە بە سەرمانداو بەشێکی ئێمەی هەژاری تێدا نیەو خۆی لە برایەتی موسڵمانان دزیوەتەوەو ئێمەش بە چاوی برایانەوە تەماشای ناکەینو حەزیش بە زیانی دەکەین کە ئەمەش رقو کینە زیاتر دەکات، بەڵێ خوای گەورە تێمان دەگەینێ کە ئەمە هەموی موڵکی خوایەو هەمو تێیدا شەریکینو تێمان دەگەیەنێ کە هەمومان برای یەکترین، وە تێمان دەگەیەنێت کە ئەو ماڵەی هەتە دەبێ بەشێکی بگەڕێنیتەوە بۆ خواروی خۆت کە هەژارەکانە.

کە ئەمە سێ سیفەتی مرۆڤی موتەقی بو، نوێژکردن، باوەڕبون بە شاراوەکان، خەرجکردن لە رێگای خوادا. ئینجا سێ سیفەتی تری ئەوانمان بۆباس دەکاتودەفەرموێ:

(٤) وە ئەو کەسانەن کەباوەڕیان هەیە بەوەی کە رەوانەکراوەتە لای تۆ ئەی محمد ﷺ کە قورئانە، وە باوەڕیان هەیە بەوەی کە رەوانە کراوە لە پێش تۆدا وەك تەوراتو ئینجیلو زەبوورو سوحوف کە موسڵمانان باوەڕیان بە هەمویان هەیەو ئەوان بە هاتنی رۆژی قیامەت یەقینیان هەیە. ئەوانە دەزانن کە بێگومان قیامەت دێت، وەحیسابیان لەگەڵدا دەکرێت، جا ئەو غەیبەی کە لە پێشەوە باسمان کرد ئەگەر مانای گشتی بێت ئەمە پێ دەوترێت تایبەت چونکە قیامەت یەکێکە لەو شتە شاراوانە. واتە (**التخصيص بعد التعميم**) لە دوای ئەوەی کەزانیمان یەکێك لە غەیبەکان ئیمان بە قیامەتە، لێرەدا دووبارە باسی کردوە بۆ ئەوەی کە بزانین بابەتەکە گرنگە، ئەم باوەڕە بە راستی مرۆڤ

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٦﴾ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَعَلَىٰ سَمۡعِهِمۡۖ وَعَلَىٰٓ أَبۡصَٰرِهِمۡ غِشَٰوَةٞۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٩﴾ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ لَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ قَالُوٓاْ إِنَّمَا نَحۡنُ مُصۡلِحُونَ ﴿١١﴾ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡمُفۡسِدُونَ وَلَٰكِن لَّا يَشۡعُرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ كَمَآ ءَامَنَ ٱلنَّاسُ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ كَمَآ ءَامَنَ ٱلسُّفَهَآءُۗ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلسُّفَهَآءُ وَلَٰكِن لَّا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا لَقُواْ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ إِنَّمَا نَحۡنُ مُسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٤﴾ ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلضَّلَٰلَةَ بِٱلۡهُدَىٰ فَمَا رَبِحَت تِّجَٰرَتُهُمۡ وَمَا كَانُواْ مُهۡتَدِينَ ﴿١٦﴾

دەگێڕێتەوە لە تاوانو لە هەڵەو لە خراپە بە راستی دوو شت زۆرکاریگەرن لە ژیانی مرۆڤدا:

**یەکەمیان**: باوەڕ بونە بە خوای تاکوتەنها، تواناو ئاگا، زاناودانا، بیسەرو بینەرو گەورەو دادپەروەر کە هیچی لا ون نابێتو زوڵمیش لەکەس ناکات.

**دووهەمیان**: باوەڕ بونە بە هاتنی قیامەت کە حیسابی لەگەڵدەکرێت، کەگرنگترین پاڵنەری مرۆڤە بۆ چاکەکاریو دورکەوتنەوە لە خراپە، جا ئەوکەسانەی کە ئەم پێنج سیفەتانەیان تێدا بێت ئەمانە لە پارێزکارانن.

﴿٥﴾ ئەمانە ئیتر کەو تونەتە سەر رێگای هیدایەتو لەسەر شەقامی راستەقینەی دینی خودان، جا بە راستی ئەمانە هەر خۆیان سەرکەوتوو رزگارن.

واتە ئەوانەی تەقواو باوەڕ بە هەمو ئەو شتانەی کە پێغەمبەرﷺ پێی راگەیاندونو کردەوی چاكو باوەڕدار بون بە هەمو پێغەمبەرانی پێشو هەمویان لە خۆیاندا کۆ کردوەتەوە ئەواونە سەرکەوتون، وشە(فلاح) واتە گەشتن بەو شتەی کە هەوڵیان بوداوەو رزگار بون لەوەی کە خۆیانیان لێدەپاراست.

بزانە کە بەرەی مرۆڤو جنوکە یان کافرنو بۆ هەمیشەی لەناو جەهەننم وە یان باوەڕدانو بۆ هەمیشە لەناو بەهەشتدان وەك اللّٰه دەفەرمویت:﴿ هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُمۡ فَمِنكُمۡ كَافِرٞ وَمِنكُم مُّؤۡمِنٞ ﴾/التغابن:

٢/ خۆی زاتەیە کە دروستی کردون جا هەندێکتان بێباوەڕەو هەندێکیشتان باوەڕدارە﴾

جا لێرەدا پاش باس کردنی خواناسان دەچێتە سەر باسی کافرانو پاشان دوورووەکان کەئەوانیش کافرانێکن کە خۆیان بە باوەڕدار پیشانی موسڵمانان دەدەن، جا موسڵمان چونکە ئاگای لەناو دڵەکان نیە ئەوەی کە خۆی بە موسڵمان پیشانداتو نوێژی بکات ئەوا وەك موسڵمانێك لەگەڵیدا هەڵسوکەوت دەکات، بەڵام اللّٰه ئاگای لە دڵەکان هەیە جا ئەوەی دوورو بێت پەروەردگار لە رێزی کافرن حیسابیان دەکاتو بەهەشتان لێ قەدەغەدەکاتو دەیانخاتە ناو قوڵترین شوینی جەهەننمەوە.بەڵێ ئایەتانی پێشو باسی خواناسان بو، ئینجا باسی بەشێکی تر دەکات کە بە پێچەوانەی خواناسان رێگای هیدایەتو سەرکەوتنیان نەگرتوتەبەرو دڵەکانیان ئەوەندە رەش بوتەوە کە تەنانەت قسەی پێغەمبەریش ﷺ کاری تێ ناکات جا دەفەرموێ:

﴿٦﴾ بێگومان ئەوکەسانەی کە کافرو بێ باوەڕن یەکسانە لایان بیانترسێنی یان نەیانترسێنی ئیمان ناهێنن.

ئەم ئایەتە هەروەك زانایان وتویانە:" **هِيَ عَامَّةٌ وَمَعْنَاهَا الْخُصُوصُ فِيمَنْ حقتْ عَلَيهِ كَلِمَةُ الْعَذَابِ** " واتە: ئەم ئایەتە شێوازێکی گشتی هەیە کە مەبەستەکەی تایبەتە بەوانەی کە بڕیاری سزایان دراوەو بە کافری دەمرن، وە مەبەستی ئەوانە نییە کە بۆ ماوەیەك لەسەر کوفردا بوون، بەڵام پاشان رێی راستیان گرتوەتەبەرو لەسەر ئەو ئیمانەش مردون،

وشەی کوفر بە مانای داپۆشاندنو شاردنەوە دێت واتە "**الستر والتغْطِيَة**". ئەوسا هەرکەسێك شتێك بشارێتەوە ئەوە پێی دەوترێت " کافر" واتە داپۆشەر جا هەربۆیە بە جوتیار کە دانەوێڵە لە ناو زەوی دەشارێتەوە دەوترێت " کافر" وەك لە سورەتی "حەدید" دا هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ /الحديد: ٢٠ / وەك بارانێك وایە کە گژوگیا سەوزبوەکانی جوتیار شادمان بکات﴾

جا هەر بۆیە بە مرۆڤی بێ باوەڕ دەڵێن " کافر" چونکە ئەو هەمو نیشانەو نیعمەتانەی پەروەردگار کە بەڵگەن لەسەر یەکتایو دەسەڵاتداری ئەو زاتە پشتیان تێدەکات وەك بییانشارێتەوە، بەڵام وشەی " الکفر" بە مانای شەرعی واتە دژو لەبەین بەری ئیمان کە بریتیە لە کافربون بە اللّٰه و بە نیعمەتەکانی، وە ئەمەش دەکرێت بە دووبەشەوە:

**یەکەم**: کوفری بچوك (**الكفر الأصغر**) کە بە کوفری نیعمەت یان " کفر دون کفر" یش دەناسرێت بریتیە: لەو گوناهە گەورانە کە

بەهۆی ئەوانەوە کابرا تاوانبار دەبێت، بەڵام لە بازنەی ئیمان دەرناچێت، لە دنیادا وەك باوەڕدارێکی تاوانبار هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرێت، وە لە دوارۆژیشدا لە ژێر ویستی پەروەردگار دایە یان دەیبەخشێت یان تۆڵەی ئەوەی لێدەکاتەوە، بەڵام سەرئەنجامیان هەر چونە بەهەشتە، ئەم گوناحە گەورانە بە هۆی ئەوەی کە رێگایەکن بۆ توش بونی کوفری گەورە لە وتەکانی شەرعدا بە کوفر ناوبراون وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموی: {**سِبَابُ الْمُسْلِمِ فُسُوقٌ وَقِتَالُهُ كُفْرٌ**/ مسلم/ قسەوتن بە موسڵمان تاوانەو شەڕکردن لەگەڵیدا کوفرە}

دووهەم: کوفری گەورەیە (**الكفر الأك** ) کە بە هۆی ئەوەوە کابرا لە بازنەی ئیمان دەردەچێتو بە کافر دەناسرێتو لە دنیاشدا وەك کافرێك هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرێتو لە دوارۆژیشدا بۆ هەتا هەتایی لە ناو دۆزەخ دا دەمێنێتەوە، کە ئەمانەش یان هەر لە ئەوەڵەوە کافربون (**الكافر الأصلي**) یان لە دوای ئیمان پاشگەزبونەتەوە لە ئیمانو تووشی ئەم کوفرە هاتوون(**ا رتد**)،

کوفری گەورەش دەکرێت بە چەند بەشەوە وەك:

کوفری سەرکەشانە (**الكفر العنادى**) کە ئەو کەسەیە کە راستیو حەقی بۆ دەرکەوتوە، بەڵام بەهۆی سەرکەشیەوە دان بەو راستیەدا نانێت،

کوفری دان پێدانەنان (**الكفر الإنكارى**) ئەو کەسەی کە بە دڵو زمان ئینکاری پەروەردگار یان دوارۆژ دەکات وەك مادەپەرستان (**الشيوعيون**).

کوفری خۆبەزلزانی (**كفر الك** ) کە ئەمەش وەك کوفری عیناد وایە بەڵام هۆکاری ئەو عینادە، ئەم خۆ بەزلزانینە، وەك کوفری شەیتان.

کوفری نیفاق (**كفر النفاق**) ئەوکەسانەن کە کوفریان لە دڵدا شاردوەتەوەو بەزمان دان بەراستی ئیسلامو ئایین دا دەنێن، ئەمە بە نیفاقی باوەڕیش (**النفاق الاعتقادي**) دەناسرێت، ئەمانە ئەگەرچی لە دنیادا تا ئەو کاتەی کە کوفرەکەیان دەرنەکەوتوە وەك موسڵمان لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت دەکرێت، بەڵام لە دوارۆژدا قوڵترین جێگای دۆزەخماڵیانە.

کوفری بە درۆخستنەوەو حەڵاڵ کردنی حەرامو حەرام کردنی حەڵاڵ (**كفر التكذيب و الاستحلال**).

جاچونکە ئەمانە خۆیان رێگای کفریان هەڵبژاردوەو دژایەتی خواو پێغەمبەریان ﷺ کردوەو لە بەر ئەوە خوای گەورە،

(٧) مۆری ناوە بە سەر دڵیاندا وبە سەر ئەندامی بیستنیاندا ، وە بە سەر چاوەکانیانەوە پەردەیەکی گەورەو ئەستور هەیە، کە راستی نابینن‌و بۆ ئەوان سزایەکی پڕ ئێش‌وئازار هەیە. دڵی مرۆڤی بێ باوەڕ سێ جۆرە (**رَان، طَبع وخَتم، قُفُل**)

ران: ئەوەیە کە مرۆڤ گوناح دەکات جا کەم کەم ئەم گوناهانە دەبن بە پەڵەیەکی رەش لەسەر دڵی گوناحکارەوە تا وای لێ دێت کە بە تەواوی دڵی دادەپۆشێ ئیتر هیچ قسەیەکی چاك نابیسێت وەك دەفەرموێ:﴿نەخێر وانیە بەڵکو رەشایی کردارەکانی خۆیان دڵی داپۆشیون﴾موتەفیفین/١٤ دڵ وەك ئاوێنەیەکە چۆن ژەنگ دەیگرێت و کەم کەم وای لێ دێت هەرچی تەماشای بکەیت هیچ نابینیت ئاوایەو بە گوناح رەش دەبێتەوەو قسەی خێرنابیسێت، پلەی لەوە گەورەترو بە زەحمەت تر (**طَبع، ختم**)ە کە ئەگەر هاتو هەر خراپەی کردو بەردەوام بو لەسەر تاوان مۆرێکی پێ دادەنرێت کەئیتر قسەیەکی چاك وەرناگرێت وەك چۆن نامەیەك دەنوسیو پاشان مۆری دەکەیت واتە تازە تەواو بو شتێکی تری نادرێتە دەم،

پلەی سێهەم قوفڵ دەکرێتو دادەخرێتو ئومێدی کردنەوەی نامێنێت، جا ئیتر نە ژیریان کار دەکاتو نە گوێکانیان راستیو حەقیقەت دەبیسێت، جا کەئەم هەمو حەقەیان بۆ باس دەکرێت، وەئەو هەمو ئاسارە گەورەیە دەبینن، بەڵام پەردە بە سەر چاویانەوەیەو راستیەکان وەك خۆی نابینن، ئەوە نەبێ کە ئەمانە چاویان کوێر بێت، بەڵام ئەو دڵەی کە لە ناوەوەیە ئەوە کوێر بوە، نە چاوی سەرو نەعەقڵی دنیایان. کاتێ کە شتەکان دەبینێ بیری لێ ناکاتەوەو پەندی لێ وەرناگرێت وەك مرۆڤی کوێر وایە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە یەکێك لە بنەماکانی باوەری ئەهلی سوننەو جەماعەت ئەوەیە کە: (**ألْإ انُ قَولٌ وعَمَلٌ يَزِيدُ بِالطاعَةِ وَيَنْقُصُ بِالْمَعْصِيَة**) واتە: ئیمان باوەڕکردن‌ودان پێدا نانی دڵەو وتەو کردارە کە بەچاکە زۆر دەبێتو بە تاوان کەم دەکاتەوە، جا وتە چ دەرونی بێت کە بەراست زانین‌و باوەڕکردنە لەدڵەوە بەبنەماکانی ئایین‌و بەچاکی سەقامگیر بونیەتی، وتەی زمانی کە دان نانە بەو بنەما سەرەکیانەو ئاشکراکردنی. کرداریش چ دەرونی بێت کەهەمو ئەو عیبادەتانە دەگرێتەوە کە جێگایان دڵ‌ودەرونە وەك ئیخلاس‌و خۆشەویستی‌و ترس‌و ئومێدو...هتد، وە چ کرداری رواڵەتی ئەوکردەوانەیە کە بەئەندامەکانی لەش دەکرێن، وە ئەمە واتای ئیمانە لەلای ئەهلی سونەتو جەماعەت کە ئیمامی شافعی لە کتێبی "**الأم**" باس لە ئیجماعی سەلەف دەکات لەسەر ئەمانەو دەڵێت: (**كانَ الإ اعُ مِن الصحابَةِ والتابِع مِنْ بَعْدِهِم، وَمَنْ أدْرَكْناهُم يَقُولونَ: الإ انُ قَولٌ وَعَمَلٌ وَنِيةٌ، لا يُجْزي وَاحدٌ مِنَ الثلاثِ إلا بِالآخِر**) واتە: ئیمان وتەو کردارو نییەتە کە هیچکامیان بێ ئەوی تریان دروست نیە) جا

ئەگەر هاتو كەسێك لە ناخی دا باوەڕی بە اللَّهُ و ئایینو ڕاستی پێغەمبەران بوو بەڵام ئامادە نەبو كە بە زمانو كردەوە بیسەلمێنێت ئەوە پێی ناوترێت باوەڕدار (أ ؤمن)، ئەگەر هەر باوەڕی دەرونیو ئەو زانینە بەس بوایە زۆربەی كافران دەبوایە بە باوەڕدار دابنرایانە خۆ دەیانوت﴿ مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى ﴾ / الزمر: ٣ / ئێمە ئەوانە هەر لەبەر ئەوەدەپەرستین تاڵە خوامانەوە نزیك بكەنەوە ﴾ ئەگەر وتەی ڕواڵەتی بێكردار بەس بوایە دەبوایە فرعونو شەیتانیش بە باوەڕدار حیسابیان بۆ بكرایە، اللَّهُ لە بارەی فیرعەونەوە دەفەرموێ:﴿ قَالَ آمَنتُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا الَّذِي آمَنَتْ بِهِ بَنُو إِسْرَائِيلَ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ ﴾/یونس: ٩٠ / وتی: بێگومان كەمن باوەڕم بوە كەهیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینە نیە بێجگە لەوكەسەی كە نەوەی یەعقوب باوەڕیان پێی بووە من لەموسڵمانانم﴾

لێرەدا بەزمان دانی نا بە تەنهایی خوادا جا ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت كەفیرعەون خۆیو دەوروبەرەكەشی لە دڵەوە خوایان ناسیوە بەشایەتی اللَّهُ خۆی وەك دەفەرموێ: ﴿ وَجَحَدُوا بِهَا وَاسْتَيْقَنَتْهَا أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴾/النمل:١٤ / بە هۆی زوڵمو خۆ بە زلزانی ئینكاری نیشانەكانیان كرد لەحاڵێكدا بە تەواوی دەیانزانی كە ئەو پەیامەی موسا ڕاستە سا تەماشاكە بزانە چۆنبوو سەرئەنجامی خراپەكاران﴾

وە یان شەیتان باوەڕی بە بوونو دەسەڵاتداری اللَّهُ و هەروەها بەهەشتو جەهەنەمو ڕۆژی دوایی هەیە، باوەڕی هەیە كە بەدیهێنەری ئەو هەمو مەخلوقاتە اللَّهُ یە جا بۆیە داوا لە خوا دەكات كەجارێ نەیكوژێت وەك لە سورەتی (صاد) دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ / ص: ٧٩ - ٨٢ / واتە شەیتان وتی: ئەی پەروەردگارم! ماوەم پێبدە تا ڕۆژی زیندوكردنەوە!اللَّهُ فەرموی: جادڵنیابە ئەوە تۆ لەماوە پێدراوانی، هەتا كاتی ڕۆژی زانراو، شەیتان وتی: جا سوێند بە عیزەتی تۆ سەر لە هەمویان دەشاوێنم﴾ وەیان لە بارەی ئەهلی كتێبەوە لە سورەتی (ئەنعام) دا دەفەرموێ:﴿ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ يَعْرِفُونَهُ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَاءَهُمُ ۘ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴾/الأنعام: ٢٠ / ئەوانەی كە كتێبمان پێدان پێغەمبەریان ﷺ دەناسی هەروەك چۆن منداڵانی خۆیان دەناسی هەر خۆیانن كە زیانیان لەخۆیان داوە كە باوەڕ ناهێنن﴾ دیارە كە ناسین و باوەڕێكی دەرونی بە بێ كردەوە سودێكی بۆ خاوەنەكەی نییەو ئەوانەی كە ئیدعای خۆشەویستی خواو پێغەمبەر ﷺدەكەن جا هەركات پێیان دەوترێت ئەی كواكردارتان؟ دەڵێن: خوا تەماشای دەرون دەكاتو ڕواڵەت گرنگ نییە، بەڕاستی زۆر بە هەڵەدا چوون، بەڵێ ڕاستە اللَّهُ بۆ وەرگرتنی كردەوەكان تەماشای نییەتو دڵەكان دەكات كە سەرچاوەو فەرماندەی كردەوە ڕواڵەتیەكانن، جا بۆیە پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: {أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ/متفق علیه/ ئاگاداربن كە لە لەشدا پارچە گۆشتێك هەیە كە ئەگەر چاك بو هەمو لەش چاك دەبێت، وە ئەگەر خراپ بو هەمو لەش خراپ دەبێت، ئاگاداربن كە ئەوە دڵە}

دەبێت ئەوەش بزانرێت هەندێك پێیان وایە كردەوە مەرجێك نیە بۆ ڕاستی ئیمان، بەڵكو مەرجێكە بۆ تەواو بوونی ئیمان واتە پێیان وایە كە ئەگەر كەسێك لە هەمو كردەوەكان وازبهێنێت مادام باوەڕی دەرونی هەیە یان بە زمان ئیعتراف بكات ئەوە باوەڕدارە، بەڵام ئیمانەكەی تەواوو كامڵ نییە، هەندێكیش پێیان وایە كە كردارەكان هەمویان مەرجن بۆ ڕاستی ئیمان، ئەمانەپێیان وایە ئەگەر یەك كردەوە وازلێبهێنرێت ئەوا كابرا كافر دەبێتو بەباوەڕدار حیساب ناكرێت وەك بیروبۆچونی "خەوارج" بەڵام بیروبۆچونی وەسەتو حەق بۆچونی ئەهلی سونەو جەماعەتە كە لە قورئانو سونەت وەرگیراوە ئەوەیە كە هەندێك لە كردارەكان مەرجن بۆ كەماڵو تەواوی ئیمان واتە ئەگەر باوەڕدار تەركی بكات ئەوە ئیمانەكەی نوقسانیو كەموكووڕی تێدایە بەڵام كافر نابێت وەك داوێن پیسی، ئەگەر هاتو باوەڕدارێك كەباوەڕی بە حەرام بوونی زینا هەبو توشی زینا بو ئەوا كافر نابێت بەڵكو ئیمانەكەی كەم دەكات، بەڵام هەندێ كردار هەن كە مەرجن بۆ ڕاستی ئیمان كە ئەگەر تەرك بكرێن ئەوە پێی كافر دەبێتو لە بازنەی ئیمان دەردەچێت وەك یارمەتی دانی بێ باوەڕ دژ بە باوەڕداران یان وازهێنان لە شەرعو حوكمی (اللَّهُ)یان تەركی نوێژ، بەگشتی دەتوانین بڵێین: هەمو كردەوەیەك كە بەجێ هێنانەكەی مەرجبێ بۆ ڕاستی ئیمان، وازلێ هێنانی كوفرە، وە هەر كردەوەیەكیش وازلێهێنانی مەرج بێت بۆ ڕاستی ئیمان، بەجێ هێنانی كوفرە. قبوڵ كردنو ڕازی بوون بە شەرعی اللَّهُ مەرجە بۆ ڕاستی ئیمان جا نارازی بوونو پشت هەڵكردن لێی كوفرە. پشت هەڵكردنو وازلێهێنان لە گاڵتە كردن بە ئایین مەرجە بۆ ڕاستی ئیمان جا گاڵتە كردن بە ئایین كوفرە. لە سیرەتدا هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ كاتی سەرەمەرگی ئەبوتالبی مامی، پێی فەرمو: {قُلْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ أَشْهَدُ لَكَ بِهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ قَالَ لَوْلَا أَنْ تُعَيِّرَنِي قُرَيْشٌ يَقُولُونَ إِنَّمَا حَمَلَهُ عَلَى ذَلِكَ الْجَزَعُ

لَأُقِرَّتْ بِهَا عَيْنَكَ /مسلم وغ ه/ واتە:ئەی مامی خۆم بڵێ " لا إله إلا ا "رۆژی قیامەت لەسەر ئەوە شایەیت بۆدەدەم، ئەبوتالب وتی: ئەگەر قورەیش نەیان وتایە ئێش‌و ژانی سەرەمەرگ وای لێکردوە، بەوتنی ئەو وشەیە چاوم رۆشن دەکردیتەوە} ئەگەرچی ئەبوتالب باوەڕی بەراستی پەیامەکەی پێغەمبەرﷺ هەبو بەڵام چونکە بە زمان ئیقراری نەکرد جا هەربۆیە بە باوەڕدار حیساب نەکرا، عەلی کوڕی ئەبوتالب کاتێك کە باوکی مرد چوە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و پێی را گەیاند جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {اذْهَبْ فَوَارِهِ فَلَما وَارَيْتُهُ رَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ لِي اغْتَسِلْ /النسائي، صححه الألبا / بچۆ بیشارەوە جا کاتێ کە شاردمەوە، گەڕامەوەلای ئینجا پێی فەرموم: خۆت بشۆرە} ئەبوتالب زۆر پشتگیری دەکرد لە پێغەمبەر ﷺ، وە زۆر خۆشی دەویست جا بۆیە عەباسی مامی پێغەمبەر پرسیاری کردلە پێغەمبەرﷺ کە ئایا ئەبوتالب لە جیاتی ئەو زەحمەتانەی هیچ سودێك وەردەگرێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: {نَعَمْ هُوَ فِي ضَحْضَاحٍ مِنْ نَارٍ لَوْلَا أَنَا لَكَانَ فِي الدَّرَكِ الْأَسْفَلِ مِنْ النَّارِ/ متفق عليه/ بەڵێ، ئەو لە ناو تەنکە ئاگرێکدایە ئەگەر تکاکاری من نەبوایە لە قوڵترین جێگای ئاگردا دەبو}بە پێچەوانەوە هەندێکیان لە ترسا یان لەبرسا بە زمان‌و بە رواڵەت خۆیان بە باوەڕدار پیشان دەداو جارجاریش لە غەزاکاندا بەشداریان دەکرد، بەهەمو شێوەیەك هەوڵیان دەدا کەخۆیان بە پیاوچاك پیشانی باوەڕداران بدەن تابەگومانی خۆیان ئابەم شێوەیە بیانخەڵەتێنن لە حاڵێکدا نازانن کە خۆیان خەڵەتاون، جا ئەگەر کردەوەو ئیقراری زمانی بە بێ بونی باوەڕی ناودەرونی بە ئیمان حیساب بکرایە دەبوایە ئەمانە بە باوەڕدار حیسابیان بۆبکرایە، بەڵام اللە بە بێ باوەڕ ناویان دەبات‌و دەفەرموێ: ﴿وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ :ئەوانەباوەڕدارنین﴾

لەم سورەتەدا دوابەدوای باسی کافران دەچێتە سەر باسی مونافق، مونافق چونکە بەرواڵەت موسڵمانە بەئاسانی دەتوانێ لە ناو کۆمەڵی موسڵمانان دا جێگای خۆی بکاتەوەو هەمو رازو نهێنیەکی موسڵمانان بزانێت لە بەر ئەوە مەترسی ئەمانە زۆرترە لە کافرەکان، بۆیە لە چەندین شوێنی قورئاندا وەك سوورەتی (التوبەو المنافقين) بە تەواوی‌و هەندێك لە سوورەتی (النورو النيسا) وچەند جێگای تر ناوبە ناو باسی کردون‌و روی دزێوی ئەوانی دەرخستوە، وا لەم سوورەتەشدا بە شێوەیەکی رونتر لە سیانزە ئایەتدا باسیان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٨) خۆهەندێك لە خەڵك دەڵێن کە ئێمە ئیمانمان هێناوە بە اللەو بە رۆژی دوای‌و دان بەوەدا دەنێن کەباوەڕدارن، بەڵام اللە دەفەرموێ: ئەوانە ئیماندار نین بەڵکو دەزانن کە اللە و رۆژی دوایی هەیە جا هەرکاتێ بەو زانینە ئیشیان کرد ئینجا دەبنە باوەڕدار.

لێرەدا پێویستە پێناسەیەکی دووڕو (المنافق) بکەین. دووڕو لە پاش چونی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە دروست بون، دووڕو ئەو کەسەیە کە بە رواڵەت چاك بێت وە لە ناو دەروندا خراپ بێت جا نیفاقی عەقیدەیی هەیە و نیفاقی عەمەلیش هەیە، نیفاقی عەقیدەیی کابرا کافر دەبێت مادام بە عەقیدە باوەڕی بە بنەماکانی ئایین نەبێت، بەڵام بە رەواڵەت شتەکان دەکات. بە پێچەوانەی " **فسق**"و " **الظلم**" لە قورئاندا هەرکات باس لە نیفاق‌و مونافق دەکات مەبەست نیفاقی عەقیدەییە. لە نیفاقی عەمەلی دا کابرا لە دڵیدا باوەڕی هەیە، بەڵام بە کردەوەکانی خراپە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ /متفق عليه/ نیشانەی دووڕو سیانن هەرکاتێ قسەبکات درۆ بکات،وەهەرکاتێ بەڵێنی بدات نەیباتەسەر،وەهەرکاتێ کرابەجێگای متمانە خیانەت بکات}

ئەگەر کابرا ئەمانەی ئەنجام دا پێی دەڵێین: کرداری دووڕوی ئەنجام داوە، بەڵام نازانرێت دووڕوە یان نە، ئەگەر لە ناو دڵی دا هەر ئاوەها بێت‌و باوەڕی بەو شتانە نەبێت، ئەوە مونافقی بیرو باوەڕییەو کابرا پێی کافر دەبێت. شوێنی (لای خواروی ئاگری جەهەنەمە) مونافق بەو مانایەی کە وتمان لە مەکە دا نەبو چونکە ئەوان لە ترسی تۆڵە لێکردنەوە ئاوا دووڕوو بون خۆڵە مەکەدا موسڵمانان دەسەڵات‌و زۆریان نەبو لە کاتێکدا پێغەمبەرﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە و خەڵکی مەدینە ئیمانیان پێ هێنا، وە ئەوس‌و خەزرەج کە دوو تیرەی گەورە بون یارمەتی پێغەمبەریان دەدا پێش تەشریف بردنی پێغەمبەرﷺ بۆ مەدینە، عبدالله کوڕی ئوبەی یەکێك لەوان بو کە(ئەوس‌و خەزرەج) هەردووکیان ئامادە بون کە بیکەن بە گەورەی خۆیان، بەڵام لە کاتێك دا کە مەسەلەی پێغەمبەرو ئیسلام هاتە پێشەوە وازیان لەم مەسەلەیە هێنا، جا لەسەر ئەوە عبدالله ی کوڕی ئوبەی رقی لە پێغەمبەر هەڵگرت. پێغەمبەرﷺ ئاگر بەستی لەگەڵ جولەکەکانی ناوخۆی مەدینەدا هەبو، بەڵام کە شەڕی بەدر کرا ئیتر ئەم کابرایە ترسی لێ پەیدا بو، چونکە ئەگەر دوژمنایەتی پێغەمبەریﷺ بکردایە بە ئاشکرا نەدەژیا، ئینجا خۆی‌و چەند کەسێك لە هاووێنەکانی هاتنە ریزی موسڵمانانەوەکە بە سەر زارەکی خۆیان بە ئیماندار پێشان دەدا، بەڵام لە ژێرەوە دژایەتی پێغەمبەریانﷺ دەکرد، ئا لەو کاتەی کە موسڵمانان هێزیان پەیدا کرد مونافقان پەیدا بوون، بەڵام جێگای سەرسوڕمانە ئەمرۆ تەماشا دەکەین ئیشەکە پێچەوانەیە

سەرەڕای ئەوەش کە حوکمی ئیسلامیش بە داخەوە نیە کابرا مونافقە وە بە دەم دەڵێت من موسڵمانم‌و ئیدعای ئیسلامی دەکات‌و هەندێ ئیشی ئیسلامیش ئەنجام دەدات، کە چی لە ناو دڵیداو لە ژێرەوە دژایەتی ئیسلام دەکات؟!

بەراستی مانای (موشریك، مونافق، موسڵمان) ئەگەر دیقەتیان لێ بکەین لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ لەگەڵ ئێستا هەرسێکیان گۆڕاون. بۆ نموونە پێشەکی ئیمانداران لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کاتێ کە قسەیەکی پێ دەوتن، فەرمودەکەیان دەبردو ئیشیان پێ دەکردو ئینجا دەگەڕانەوە کەسی واهەبو کە دوا دەکەوت پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ دەکرد بۆ ئەوەندە دوا کەوتیت؟ وەڵامی دەدایەوە دەیوت: ویستومە ئەو چەند ئایەتەی کە بردوومە کاری پێ بکەم ئینجا بێمەوە بۆ لات، بەڵام بە داخەوە ئێمە ئەو هەموو ئایەتە دەزانین، ئەو هەموو شتە لە بارەی ئیسلامەوە دەزانین وە خۆشمان بە موسڵمان دەزانین بەڵام کامەیە ئیشکردنی ئێمە بەو زانینەی خۆمان؟ کەوا بو ئێمە لەگەڵ موسڵمانانی پێشوو گۆڕاوین‌و لە یەك ناچین؟ موشریکەکانی پێشوو کاتێ توشی بەڵاو موسیبەت‌و نارەحەتی دەبون ئا لەو کاتەدا زۆر بە ئیخلاسەوە روویان دەکردە اللّٰه و باوەڕی خۆیان دەگۆڕی‌و دەیان وت هیچ کەس دەور نابینێت‌و هیچ کەس بە کەڵك نایەت جگە لە اللّٰه هەتا دەگەیشتنە وشکایی جاکاتێ کە دەگەیشتنە خۆشی و ترسیان نەدەما موشریك دەبوون، بەڵام بە داخی گرانەوە ئەمڕۆ موسڵمانان لە کاتی تەنگانەدا خۆیان موشریك دەکەن‌و هاوار دەکەنە دەیان ناوی غەیری اللّٰه. تەواو بە پێچەوانەی موشریکانی کۆن! پەنا بە خوا ﴿کێ هەیە بێجگە لە اللّٰه وەڵامی ناچاران بداتەوە هەرکاتێ هاواری لێ بکەن وئەو تەنگو چەڵەمەیان لەسەرلابات؟﴾ النمل/٦٢،

کابرای دووڕو چونکە حاکمیەتی اللّٰه بو ئەگەر موسڵمانێکی رێك‌و پێك نەبوایە لێیان قەبوڵ نەدەکرد، جا تواناى شەڕی نەبوو خۆی بە موسڵمانێکی راست پیشان دەدا خۆ ئیمڕۆ موسڵمان هیچ دەسەڵاتێکی نیە، کەچی دەبینی کابرا دووڕووەو هەڵسوکەوتی دووڕوانە دەکات‌و بە نیفاقێکی ئاشکراو روونەوە جا بۆیە پاش ماوەیەکی کەم کە ئەم دووڕوە نوێیانە سەریان هەڵدا، حوزەیفە رضي الله عنه کە بە "**صاحب سر رسول ا** ﷺ" دەناسرێت‌و ناوی دووڕوانی دەزانی فەرموی: {إِنَّ الْمُنَافِقِينَ الْيَوْمَ شَرٌّ مِنْهُمْ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ كَانُوا يَوْمَئِذٍ يُسِرُّونَ وَالْيَوْمَ يَجْهَرُونَ /البخاری/ مونافیقەکانی ئەمڕۆ لە مونافیقەکانی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ خراپترن، چونکە ئەوان نیفاقەکەیان دەشاردەوە بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ ئاشکرای دەکەن}

ئەگەرچی ئەو نیفاقە ئاشکرایە بەڵگەیە لەسەر کوفرێکی ئاشکرا جا هەربۆیە ئەو حوزەیفەیە رضي الله عنه دەڵێت: {إِنَّمَا كَانَ النِّفَاقُ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَأَمَّا الْيَوْمَ فَإِنَّمَا هُوَ الْكُفْرُ بَعْدَ الْإِيمَانِ/البخاری/ واتە:لەراستیدا نیفاق تەنها لە زەمانی پێغەمبەردا ﷺ بوە بەڵام ئەمڕۆ کافربونە لە پاش باوەڕدار بون) چونکە کابرا لە بنەماڵەیەکی موسڵماندا لە دایك بووەو باوەڕدار بوە بەڵام بەو هەڵسوکەوتانە توشی کوفری نیفاق بوە، وە ئەمانە هەڕەشەیەکی گەورەن بۆ کۆمەڵگەی موسڵمانان، جابۆیە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ أَخْوَفَ مَا أَخَافُ عَلَى هَذِهِ الْأُمَّةِ كُلُّ مُنَافِقٍ عَلِيمِ اللِّسَانِ/ا د، الط ا ،صححه الالبا / واتە: بێگومان ئەو شتەی کە لەهەموشت زیاتر لێی دەترسم بۆ ئەم گەلەم هەمو مونافقێکی زمان زانایە}

جا وادەرکەوت کەیەکەم وەسفی منافقان درۆزنیە دەڵێن: ئێمە ئیمانمان هێناوە بە اللّٰه‌و بە رۆژی قیامەت،

(٩) ئەمانە دەیانەوێت بەم درۆو دەلەسانە فێڵ لە خوداو فێڵ لە ئیمانداران بکەن‌و بەم قسانە دەیانەوێت کەموسڵمانان بخەڵەتێنن‌و وایان تێ بگەیەنن کە موسڵمانن‌و برای ئەوانن وە لە ژێرەوە هەرلەسەر بیرو باوەری خۆیانن اللّٰه دەفەرموێ: ئەمانە تەنها نەفسی خۆیان دەخەڵەتێنن چونکە اللّٰه ئاگاداری ئەوانە، ئەمانە دەیانەوێت بەم قسانە اللّٰه لێیان خۆش بێت، بە راستی لێیان خۆش نابێت چونکە خوای گەورە دەزانێ ئەوانە خەریکی چین، هەروەها ئیمانداریش مونافقان دەناسن چونکە اللّٰه وەسفی مونافقانی ئەوەندە بە چاکی بۆ رۆشن کردونەتەوە، هەر کەمێك هەڵسو کەوتیان لەگەڵ دا بکەین بە چاکی دەیان ناسین، بۆ نمونە چەندین جار عەبدوڵای کوڕی ئوبەی موسڵمانان ویستویانە بیکوژن، وە چەند جار پاڵەوانی ئیسلام عومەری کوڕخەتاب وتویەتی ئیجازە بدەن با من بیکوژم، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: من دەزانم مونافقەو حەقی کوشتنی هەیە، بەڵام دوژمنان پڕوپاگەندە دەکەن‌و دەڵێن: محمد دۆستانی خۆی دەکوژێت لە بەر ئەوە ئیجازەی نەداوە بیکوژن کە پێغەمبەری خوا ﷺ ناسیویەتی بەڵکو ناوی مونافقان بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتووە یەکێك لە یارانیشی ناوی حوزەیفەیە وەك وتمان پێغەمبەری خوا ﷺ ناوی هەمو مونافقانی پێ وتوە، جا ئاوا دەرکەوت کە ئەمانە فرو فێڵیان هەر لە نەفسی خۆیان کردوە، بەڵام هەست‌و شعوریان نیە واتە سیفەتێکی تری مونافقان ئەمەیە کە مرۆڤێکی بێ هەست‌و بێ دەرکن ئەگەر خاوەن هەست بونایە ئاوایان بە خۆیان نەدەکرد.

(١٠) ئەوانە لە ناو دڵیاندا نەخۆشی هەیە ناچار بەم حاڵەتەرازی بون کە بە رواڵەت ئیسلام‌و لە ژێرەوە ناموسڵمان! سا اللّٰه ئەو

نەخۆشیەیان بۆ زیاد بکات، وە بۆ ئەوان هەیە سزایەکی دەردناك بە هۆی ئەو درۆیەی کە دەیکەن.

چونکە خۆیان بون بە هۆی ئەو نەخۆشیە، خوای گەورەش نەخۆشی بۆ زیاد کردن، جا ئەم رستەیە ﴿ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضًا ﴾ لێرە خەبەرە، بەڵام دەگونجێ بە مانای (إنشاء) بێت واتە دوعا بێت وەك مانامانکرد.

(١١) جا هەر کاتێك پێیان بوترێت لەم سەر زەویدا خراپە مەکەن، تاوان مەکەن، خەڵك مەکوژن، بەناحەق ماڵی خەڵك مەخۆن ، دژایەتی ئایین مەکەن، جاسوسی مەکەن» پشتگیری بێباوەڕان مەکەن دەڵێن: ئێمە پیاو چاکین، بەرژەوەندی خەڵکمان دەوێت، دەمانەوێت خەڵك بحەسێتەوە، خەڵك بە ئاسودەیی بژیت، ئا بەم شێوەیە بۆ فریودانی خوڵك دێنە پێشەوە.

وەك ئەمرۆ کە دەیبینین لە زۆر شوێندا ئەوانەی کە بەرامبەر موسڵمانان دەوەستن دەڵێن: موسڵمانان ئیرهابین، پیاو کوژن، وەزع لە خەڵك تێك دەدەن، سەر لە خەڵك دەشێوێنن، ڕێگای بڵاو بونەوەی ئایینی ئیسلام دەگرن‌و دژی حوکمی ئیسلام دەوەستن‌و پێیان وایە ڕێگایەکی چاکەو بەرنامەیەکی چاکەو پێی دەژین، ناترسن لەوخوایەی کەدروستیکردون ودەشبرێنەوە بەردەمی‌و دەڵێن ئێمەش دەبێ لەگەڵ خەڵك بەرەو پێش بچین، حوکمی ئیسلام بۆ ئەم بارو دۆخەی ئەمرۆ ناگونجێ؟ یان دەڵێن دەبێت نێوان کوفرو ئیمان لەیەك نزیك بکەینەوەو ئێمە چاکە خوازانێکین کە پردێکین لە نێوان موسڵمانان‌و کافراندا وەك پێغەمبەر ﷺ لە وەسفیان دا دەفەرموێ:{ مَثَلُ الْمُنَافِقِ كَمَثَلِ الشَاةِ الْعَائِرَةِ بَيْنَ الْغَنَمَيْنِ تَعِرُ إِلَى هَذِهِ مَرةً وَإِلَى هَذِهِ مَرةً/مسلم وغ ٥/ وێنەی موناڤق وەك مەڕێك وایە کە لە نێوان دوو کۆمەڵ مەڕدا دێت‌ودەڕوات نازانێت شوێن کامیان کەوێت‌وهەردەمێك لای یەکێکیانە}

دەی ئایا نابینن ئەو هەمو فەسادەی کە ئەمرۆ لە جیهاندا هەیە لەگەڵ ئەوەشدا کە حوکمی ئیسلام وجودی نیە، جا ئەگەر ئیسلام فەسادو تێکدەرەو غەیری ئیسلام چاکە، ئەی بۆ تائێستا دنیاتان چاك نەکردوە، خۆ ئێستا خۆتان حاکم‌و دەسەڵاتدارن؟! کێ ڕێی لێ گرتوون، کێ ئەمرتان پێ دەکات کەخراپە بکەن؟.

(١٢) ئاگاداربن بەبێگومان ئەوان هەر خۆیانن خراپەکار وخراپەکێڵ بەڵام بەهۆی ئەوەی کە دڵەکانیان نەخۆشە هەست بە گومڕاهی‌و خراپەکاری خۆیان ناکەن.

(١٣) خۆ هەر کاتێکیش پێیان بوترێت وەك چۆن ئەم خەڵکە ئیمانی هێناوە ئێوەش ئیمان بێنن دەڵێن: ئایا ئێمە باوەڕ بێنین وەك ئەوگێل و گەمژانە؟ واتە: یارانی پێغەمبەر ﷺ بەنەزان ناو دەبن کە چۆن بە گیان‌و بە ماڵ لە خزمەت ئیسلامدان‌و لەو ڕێگەدا هەمو سەختی‌و دژوارییەك قەبوڵ دەکەن وەك ئەمرۆ دەڵێن: ئیسلام کۆن بوە، دنیا بەرەو پێشکەوتن دەڕوات، وە ئیسلام بە جەهالەت‌و دوا کەوتو دادەنێن، کاتێ کابرای موسڵمان گرفتار دەبێ لەسەر دین زۆر کەس بە نەزان‌و گەمژە ناوی دەبات‌و پێی دەڵێن: تۆ خەریکی چیت دانیشە لە ماڵی خۆت وازی لێ بێنە بۆچی خۆت خەریکی ئەو ئیشانە دەکەی؟ برۆ ئیشی خۆت بکە حەقت بە سەر ئەو ئیشانەوە نەبێت، ئا بەم شێوەیە بە موسڵمانان دەڵێن. بەڵام ئەگەر کابرا لەسەر ڕێبازو بەرنامەیەکی تری غەیری ئیسلام بێت بەو دەڵێن: تۆ قارەمانیت‌وتۆ شۆڕش گێڕیت؟ ئەبێ مرۆڤ مەردانە بژیت؟

بەڵێ ئیشی ئیسلامی بە بێ سودو موسڵمان بە نەفام دادەنێن، بۆیە ﷲ لە وەڵامیان دا دەفەرموێ: ئاگادار بن کە ئەوان خۆیان گێل‌و گەمژەو بێ سیاسەتن و ئەوەندە نەفامن کە ئەم ڕاستیە نازانن، ئەگەر نەزان نەبونایە ئاوڕێکیان لەپێش خۆیان دەدایەوەو پەندیان لەخوانەناسانی پێش خۆیان وەردەگرت‌و ئاوا ڕەفتاریان نەدەکرد، بەراستی ئەوەندە گێل و گەمژەن نازانن کە خۆیان کەوتونەتە چ گۆمێکەوەو لە چ وەزعێکی خراپدان‌و دوا ڕۆژیان بەرەو کوێ دەڕوات؟ ئەگەر عەقڵیان بەوە بشکایەوەپەیان بەوڕاستیە ببردایە ئاوا ڕەفتاریان نەدەکرد؟!

(١٤) وەسیفەتێکی تریان ئەوەیە کاتێ کە دەگەن بە باوەڕداران دەڵێن: باوەڕمان هێناوەو هەر کاتێ کە دەگەن بەسەرۆك‌و ڕەفیقە شەیتان سیفەتەکانیان دەڵێن: بێگومانبن کەئێمە لەگەڵ ئێوەداین، بێگومان کەئێمە گاڵتە بە موسڵمانان دەکەین‌و پێیان ڕادەبوێرین‌و باوەڕمان بە ڕێبازو ئیشەکانیان نیە.

(١٥) بەراستی ﷲ ئەوان ترۆو ڕسوا دەکات‌و بە بۆنەی ئەوەی کە ئەوان خۆیان خراپن‌و تاوان دەکەن‌و بوون بە هۆی تاوانی خۆیان خوای گەورەش یارمەتیان دەدات تا لە توغیان‌و سەرکەشی‌و گومڕاهیدا زیاتر بڕۆنە خوارەوە، ئەوەیەپاداشتی گاڵتە کردنیان بە موسڵمانان؟

واتە: ﷲ خۆی خاوەنی دەسەڵات‌و هێزە بۆ چاکە کارو خراپەکار، وە هەر خۆیەتی هاوکاری دەکات بۆ چاکەو خراپە، ئەگەر ﷲ کۆمەکیان پێ نەکات‌و یارمەتیان نەدات خۆ ئەوان ناتوانن هیچ کارێ ئەنجام بدەن، بەڵام خوا، خوای هەمو مرۆڤەکانەو یارمەتی هەمو مرۆڤێك بەستراوە بە هێزی خواوە، جا ئەگەر بێت‌و یارمەتی نەدات مانای وایە ﷲ بە زۆر چاکە یان خراپە لە خەڵك قەدەغە دەکات؟ ﷲ سەرپشکێتی داوە بە مرۆڤ، مرۆڤ خۆی ڕێگا

مَثَلُهُمۡ كَمَثَلِ ٱلَّذِي ٱسۡتَوۡقَدَ نَارٗا فَلَمَّآ أَضَآءَتۡ مَا حَوۡلَهُۥ
ذَهَبَ ٱللَّهُ بِنُورِهِمۡ وَتَرَكَهُمۡ فِي ظُلُمَٰتٖ لَّا يُبۡصِرُونَ ﴿١٧﴾ صُمُّۢ
بُكۡمٌ عُمۡيٞ فَهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿١٨﴾ أَوۡ كَصَيِّبٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فِيهِ
ظُلُمَٰتٞ وَرَعۡدٞ وَبَرۡقٞ يَجۡعَلُونَ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِم مِّنَ ٱلصَّوَٰعِقِ
حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِۚ وَٱللَّهُ مُحِيطُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٩﴾ يَكَادُ ٱلۡبَرۡقُ يَخۡطَفُ
أَبۡصَٰرَهُمۡۖ كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ
وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَذَهَبَ بِسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ
شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ
وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ
ٱلۡأَرۡضَ فِرَٰشٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ
بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا وَأَنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ ﴿٢٢﴾ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا
فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ
إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ وَلَن تَفۡعَلُواْ فَٱتَّقُواْ
ٱلنَّارَ ٱلَّتِي وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُۖ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾

هەڵدەبژێرێت، بەڵام هێزی ئیشکردنەکەی تەنها لە دەست خوادایەو بەس، کەوا بو لەسەر سەرپشکێتیەکەیەتی کە کابرا تۆڵەو پاداشتی خۆی وەر دەگرێتەوە، لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە: {إذَا رَأَيتَ ا ـ تَعَا ـ يُعطِي العَبدَ مِنَ الدنيَا مَا يُحِب وَهُوَ مُقِيمٌ عَلَى مَعَاصِيهِ فَإنمَا ذَلِكَ مِنهُ اسِتدرَاجٌ/صححه الالبا / ئەگەر بینیتان کە ﷻ بەخشی بەکەسێك ئەوەی کەپێی خۆشە لەدنیاداو ئەوهەر سوربولەسەر تاوانکاری خۆی ئەوسا بزانن کەئەوە بەرزکردنەوەیەتی لەلایەن خواوەبۆپشت شکاندنی}

ئینجا پاش ئەوەی کە ئەم سیفەتەخراپانەی مونافقی باس کرد، دەفەرموێ:

﴿١٦﴾ ئەوانە کەسانێکن کە گومڕاهیان کڕیوە بە هیدایەت، جا بە ڕاستی ئەوان لەم ئاڵوگۆڕ وبازرگانیەی کە کردیان قازانجیان نەکرد جا ئەوان چونکە هیدایەتو ڕێنماییان نەویستوە ڕێنمایی نەکراون، وەك ئەوە کەسەرەتا هیدایەت دراوێك بوە لە لای ئەوانو گومڕاهیش کاڵایەکی ناو بازاڕ بوبێت چونکە مرۆڤ کاتێ کە لە دایك دەبێت لەسەر فیترەتی ئیسلامە جا لە پاشدا دایكو باوکی دەیکەن بە گاور، بە جولەکە، بەئاگر پەرستو بە موشریك، لەڕاستیدا ئەمە گاڵتە کردنە بەو موناففقانە، جا بۆپیشاندانی وێنەی خوانەناسان خوای گەورە دوو نمونە دەهێنێتەوەو دەفەرموێ:

﴿١٧﴾ وێنەی ئەوانە وەکو وێنەی کەسێکە کەوا ئاگرێك هەڵگیرێنێت، جا کاتێ کە ئەو ئاگرە هەڵگراو شەوقی دایەوە خوای گەورە ئەو روناکیەی کە هەیانەو سودی لێ وەردەگرن لای بباتو ئاگرەکەیان بکوژێنێتەوەو وازیان لێ بهێنێ لە ناو تاریکاییەکی وادا کە هیچ نەبینن‌و نەتوانن لە جێگای خۆیان دا تەکان بخۆن.

﴿١٨﴾ کەڕن لەبیستنی ڕاستیو قسەی چاك، لاڵن لەوتنی قسەی حەقو زمانیان نیە قسەی باشی پێ بکەن، کوێرن حەق نابینن‌و ئەوهەمو شوێنەوارە گرنگانە کاریان تێ ناکات، جا بۆیە ئیتر ئەوان ناگەڕێنەوە بۆ ڕێگای ڕاست. لە بارەی ئەم نموونەوە زانایان ڕایان زۆرە، بەڵام ڕۆشنترو کورتر لە هەموویان ئەوەیە کە: ئیسلام تەشبیهکراوە بە ئاگر، واتە چۆن ئاگر روناکیو ڕۆشنایی دەدات ئیسلام ئاوەها روناکیە. هەندێك دەڵێن: ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ ئەلفو سین‌و تاکەی زیادەیە. خۆی (وقد)ەیە واتە خۆی هەڵگیرسێنەری ئاگرەکەیە، بەڵام ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ داوا دەکا بۆ هەڵگیرساندنی. من لێرە ئەمەم پێ جوانترە هەر لە حالەتی خۆی بمێنێتەوە،و الله اعلم. واتە ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ بێت چونکە هەمو کەسێك لە سەرەتاوە داوای هیدایەتو خێر دەکات هەروەك چۆن جولەکەکان بە خەڵکی مەدینەیان دەوت: لە مەودوا پێغەمبەرێك دێتو ئێمە دوای ئەو دەکەوین‌و هەر هەموتان دەکوژین، واتە هەموویان هەر لە سەرەتاوە چاوەڕوانی ئەوەیان هەبوە کە پێغەمبەرێك دێت، هەروەك لە هەمو سەردەمێكو لەهەمو زەمانێکدا مرۆڤ پێی خۆشە مرۆڤێکی داد پەروەر هەبێت. کەوا بو ﴿ٱسۡتَوۡقَدَ﴾ خۆیان داوای پەیدا بوونی روناکیان دەکرد، بەڵام کاتێ کەپەیدا بو پەیڕەوییان نەکرد واتە خۆیان روناکیو ئاگرەکەیان کوژاندەوەو لە تاریکی کوفر و خوانەناسیدا مانەوە ئەمە نموونەی یەکەم بوو،بۆ نمونەی دووهەمیش ـ دەفەرموێ:

﴿١٩﴾یان وەکو چۆن بارانێك لە ئاسمانەوە بباریێت کە لەگەڵ ئەو بارانەدا تاریکیو دەنگی هەورو بروسکە هەبێت کە ئەمانە بۆ خۆپاراستن لەمردن ئەنگوستیان دەخستە ناو گوێچکەیانەوە تا گوێیان لەدەنگی هەورەکە نەبێت؟! لە حاڵێکدا کە ﷻ چوار دەوری کافرانی گرتوەو بە هیچ شێوەیەك لە دەستی ﷻ دەرناچن.

﴿٢٠﴾ئەو بروسکەی کە لە ناو ئەو بارانەدا هەیە ئەوەندە بەپەلەو روناکە نزیکە چاویان دەربکات جا هەر کاتێك روناکی بکات بۆیان ئەمانە چەند هەنگاوێك دەنێن، بەڵام هەرکاتێ کە تاریکیی بدات بەسەریاندا دەوەستن‌و ناتوانن هیچ تەکانێك بخۆن، جا ﷻ ئەگەر

ئارەزۆی لێ بێت گوێچکەیان کەڕ دەکاتو چاوانیان کوێر دەکات، ئەوان دەیانەوێت چاویان بپارێزن تا ئەم بروسکەیە کاریان تێ نەکاتو لە ترسی کەڕ بوون گوێچکەیان دەگرن، بەڵام نازانن گوێو چاویان بە دەست خوایە ئەگەر ئارەزۆی لێ بێ هەر دووکیان لە ناو دەبات؟ جا دەبێ ئەوان بزانن کە ﷲ دەسەڵاتی بە سەر هەمو شتێك دا هەیە.

لێرەدا دینی ئیسلام تەشبیهکراوە بە باران دیارە ئەو دینە وەك بارانێك وایە کە مایەی خێرو خۆشبەختی ژیانی هەمو گیان لەبەرانە چونکە هەمو شتێك لەم بونەوەرەدا ژیانی بە هۆی ئاوەوەیە کەواتە ئیسلام ژیانە وەك ﷲ دەفەرموێ:﴿هەر کاتێك کەخواو پێغەمبەر ﷺ بانگیان کردن بۆ ژیان بڕۆن بە پیریانەوە﴾ئەنفال/٢٤ . واتە: ئەوەی کە ژیانی سەروەرانە بە ئێوە دەدات تەنهائیسلامە. ئەو بارانە دەنگی هەوری تێدایە وە بروسکەشی تێدایە، لێرەدا دەگونجێ تەشبیهی رستە بە رستە بێت، یان نموونە بە نموونە کە یەکەمیان دەنگە کە بریتیە لە ئاگاداری کردنەوەیەك کە لە قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەردا ﷺهەیە، بۆ نموونە دەڵێت: فلانەشت نەکەن ئەو سزایەی هەیە، جەهەننەم ئاوەهایە و سزایەکەشی بریتیە لەو هەمو جۆرانەو لەو رێنمایەی کە راستە رێگەی ئیسلام پێشان دەدات، بەڵام ئەمانە لە جیاتی ئەوەی کە لەو ئاگاداریکردنەوە بترسنو خۆیان بپارێزن لە خراپە کاری کەچی گوێچکەی خۆیان دەگرن بۆ؟ هەتا ئەو ئاگاداری کردنەوە نەبیستن کە بە خەیاڵی خۆیان پێیان وایە ئەو ئاگاداری کردنەوە ئەوان دەکوژێت، هەروەکو لە ئایەتی تردا هاتوە کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەعوەتی دەکردن بۆ دینی خوا دەیان وت:﴿ ئەی محمد ئەگەر دوای تۆ بکەوین لەم وڵاتەی خۆماندا لەناومان دەبەن﴾ قەسەس/٥٧، لێرەش دەفەرموێ: کاتێك کە ئەم بروسکەیە دەهات واتە کاتێك کەئایەتی قورئانیان بۆ دەخوێندرایەوەو دەی ترساندنو رێنمایی دەکردن گوێی خۆیانیان دەگرت تا ئەم قسەیە نەبیسن، لەو لایشەوە ئەو بروسکەیە کاتێ کەروناکی دەکردو بەرچاویان رۆشن دەبویەوە واتە: کاتێ بەهۆی ئیسلامەوە سودێکیان دەست کەوتایە دڵیان ئارامی دەگرت، بەڵام هەرناخۆشیەك بهاتایە پێشیان خۆیان مت دەکردو هیچ پەیوەندیەکیان بەئیسلامەوە نەدەما؟! ئێستاش کە دەبینین کاتێك کە باسی ئایین دەکرێت بۆ کابرا دەڵێت: ئەمە چیە و کەی باوی ئەو قسانە ماوە؟ یان بۆمان زەحمەتەو ناکرێت، جا نەك هەر ئەوە بەڵکو دەیان قسەی ناشیرین بەرامبەر بەئایینو ئیسلامو پەیڕەوانی دەکەن، هەندێك دەڵێن: کۆنە پەرستن واتە ئایین کۆنە پەرستیە بە راستی ئەمانە هەموی بەڵگەی نەزانینو بێ عەقڵی خۆیانە؟ خۆ ئەوەی کە ئەوان ئەمڕۆ بانگی بۆ دەکەن

هەمویان شتانێکن کەسەدان بەڵکو بە هەزاران ساڵ پێش ئیسلام کراون و لەهەمو سەردەمێکیشدا پێغەمبەرانو پیاوچاکان بەگژیانداچوون؟! پێم ناڵێن شتە تازەکانتان کامەیە؟ بەڵێ بەشێك لەو ئیشانەی کە ئەمڕۆ ئێوە پێیدا دەنازن بریتیە لە: دزیو گزیو شەرواڵ پیسیو قومار وعارەق خواردنەوە، کافرایەتیو بێ رەوشتی، روتکردنەوەی ئافرەت لە ئایینو رەوشتو پۆشاكو پارچە پارچەکردنی خەڵكو خوێن مژینی بەناو حیزبایەتیەوە ... و...و...هتد .

توخوا پێم بڵێن ئەمانە کامیان تازەیەو جێگای رێزە بۆتان؟ جا ئەی نەفام کێ کۆنە پەرستە؟ بەڵێ راستە نەخۆش بەئاوی شیرین دەڵێ تاڵە؟! تۆ بانگ دەکرێیت بۆ ئایینێك کە قسەی خوای خۆتە کە عیلمی ئەوەڵو ئاخیری هەیەو بەرنامەیەکی تێرو تەواوی وای بۆداناوی کە زیاتر لە دوانزە سەدە فرمانڕەوایی کردوەو هەر کاتێ بە چاکیش پەیڕەوی کراوە بە شایەتی دۆستو دوژمنی ئەو سەردەمە بۆ مرۆڤ سەردەمی زێڕین بووە، بەڵێ دەبێ وابێ چونکە پەیامو بەرنامەی دروستکەری مرۆڤەو چاك دروستکراوی خۆی دەناسێت، دەزانێت چی باشە بۆیو چی دەبێ بە مایەی خێر و خۆشبەختی هەردوو دنیای بۆیە دەفەرموێ: ئەگەر لاتان دا لەسەر ئەم رێگایە تووشی بەڵاو موسیبەت دەبن، بەڵام ئەگەر ئەم رێگایەتان گرت واتە رێگای ئیسلام، تووشی خێرو خۆشی دنیاو قیامەت دەبن. دنیای ئەمڕۆ چونکە لای داوە لەم ئاینە وا تووشی ئەو هەمو بەڵاو موسیبەتە بووین، بە داخەوە ئەم مرۆڤەی ئەمڕۆ وافریو دراوەو مێشکی بە خوانەناسی بەنج کراوە، کاتێك کە بانگی دەکەیتو دەتەوێت لە ئایینی ﷲ شارەزا بێت کە مایەی خۆشیو کامەرانی هەردوو ژیانیەتی لە باتی سوپاس دژایەتیت لەگەڵدادەکات؟!! زۆر جار لە رۆژانی جومعە دا لە باتی نوێژی جومعەو پەند وەرگرتن لە وتاری جومعە دەڕۆن بۆ رابواردن؟! ئەمانە هەموی نیشانەی ئەوەن کە مرۆڤ کەوتوەتە ناوبەدبەختیو نەزانیەوە. ئەمە دوو نموونە بوون لە بارەی ئیسلام وکفرەوە، لە نموونەی یەکەم دا فەرموی وەکو ئاگرێك وایە کە هەڵی دەگیرسێنن کە روناکیان بۆ بکات، بەڵام کاتێ کە روناکیان بۆ دەکات ئاگرەکە بکوژێتەوەو ئەوان لە تاریکایدا بمێننەوە، واتە ئەم دینە نیعمەتو خێرو روناکی بوو، بەڵام ئەوان وازیان لێ هێنا لە گومڕاهیدا مانەوە. وە لە نموونەی دووهەمدا ئیسلام وەکو بارانێك لە ئاسمانەوە بێتە خوارەوە کە دەنگی هەورو بروسکەی لەگەڵ دا بێت کاتێ کە بروسکە دەدات دەبێت بە روناکی جا ئەوان هەنگاو دەنێن، بەڵام کاتێ کە تاریکی کرد دەوەستن، واتە ئەوان لە باتی ئەوەی کە رێگەی خوا بگرنو سوود لەو روناکیە وەرگرن گوێی خۆیان دەگرن تا ئەو راستیە

نەبیستن. بەڵێ ئەم دوو نموونەیە لە تەواوی ئەو مرۆڤانەی کە دژایەتی دینی الله دەکەن لە هەمو زەمانێکدا بوەو هەیە ئەوەتە ئەمڕۆ ئەو ئیسلامەی کە مایەی ژیانەو روناکیە، بە کۆنە پەرستو شتێکی کەم نرخ دایدەنێن؟ ! بە راستی ئەوە هەر وڕێنەیەکەو درێژەی هەیە، ئینجا پاش ئەوەی کە الله باسی سیفەتی باوەڕداران‌و کافران‌و مونافقانی کرد، روولەهەموخەڵك دەکات‌و دەفەرموێ:

(٢١) ئەی خەڵکینە ئەو پەروەردگارە بپەرستن کە ئێوەی لە نەبوون دروستکردوەو ئەو کەسانەی پێش ئێوەش، هیوا وایەو وا چاوەڕوان دەکرێت لە ئێوە کە ئێوە لە الله بترسن‌و خۆتان بپارێزن لە تۆڵەو سزای پەروەردگارتان بە خۆ پاراستن لە گوناح‌و لە خراپەو دژایەتی خوا.

(٢٢) کە زەوی بۆ ئێوە کردوە بە فەرش‌و رای خستوەو ئاسمانی کردوە بە سەربانێك بۆتان‌و لە سەرەوە ئاوتان بۆ دەنێرێت، ئەوسا بەو ئاوە هەمو بەروبوومەکان سەوز دەکات بۆ ئەوەی کە رۆزییەکی لێ دەربهێنێت بۆ ئێوە کەهەر خۆی بە تەنهایی کردوونی‌و هاوبەشی نیە، کەواتە پێویستە لەسەر ئێوەش کە هاوبەشی بۆدانەنێن لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێوە خۆتان دەزانن کە شەریك دانان بۆ الله شتێکی بێهودەیەو بێ سودەو هیچ کام لەو ئیشانەتان بۆناکات. جا ئەم بانگەوازە گشتیەو قورئان داوای لە تەواوی مرۆڤ کردوە کە روو بکەنە ئایینی الله، کەواتە بانگخوازانی ئایین دەبێ بزانن کە ئیسلام تەنها بۆ کۆمەڵێکی تایبەت نیە، بەڵکو بۆ هەمو خەڵکەو ئەو بانگەوازە دەبێ بە گوێی هەمو خەڵك بگات‌و هەمو کەسێك تەبلیغ بکرێت، ئەوەی کە تەبلیغی پێ نەگات لەسەر نەناسینی ئیسلام گوناهی ناگات‌و هەر کەسێك ئەم ئیسلامە بناسێت‌و کەسانێکی تر هەبن ئەم تەبلیغەیان پێ نەگەیشتبێت‌و توانای هەبێ تێیان بگەیەنێ ئەرکی سەرشانیەتی کەئیسلامیان پێ بناسێنێت ئەگینا تاوانبارەو حەقی شاردوەتەوە. جاپاش ئەوەی کە خالقیەت‌و رازقیەتی‌و ئیلاهیەتی خۆی پێشانی ئێمە دا دەفەرموێ:

(٢٣) ئەگەر ئێوە لە گومان دان لە بارەی ئەوەی کە ئێمە ناردومانە بۆ سەر بەندەی خۆمان محمدﷺ و پێتان وایە کەقسەی ئێمەنیە، جا وەرن یەك سوورەت بێنن بە ئەندازەی سوورەتێکی ئەم قورئانەوجگە لەخوداش هەرکەستان بۆ ئامادە دەبێت بانگی بکەن با یارمەتیتان بدات ئەگەر راست دەکەن.

دیارە ئەم سوورەتە لە مەدینەدا هاتوە، لە پێش ئەمەشدا لە سوورەتە مەکیەکان دا ئەم داوایە چەند جار کراوە بۆ چەسپاندنی راستی قورئان‌و دەم کوتکردنی نەفام‌و نەزان.

جارێکیان فەرموی با وێنەی ئەم قورئانە بێنن نەیانتوانی. ئایەتەکان بەم شێوەیەن:﴿کتێبێکم بۆ بێنن لە لایەنی خواوە کە تەواوترو رێ پیشاندەر بێت لەو دووانە من دوای دەکەوم ئەگەر راست دەکەن﴾قەسەس – ٤٩.

﴿ پێیان بڵێ ئەگەر مرۆڤو جنۆکە کۆببنەوە لەسەر ئەوەی کە وێنەی ئەم قورئانە بێنن، هەرگیز ناتوانن وێنەی بهێنن، ئەگەر هەندێکیشیان پشتگیری هەندێکیان بکەن﴾ /ئیسرا – ٨٨.

هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ:﴿ دەڵێن ئەم قورئانە درۆیەو محمد ﷺ خۆی دروستی دەکات‌و خۆی دەینووسێتەوە، پێیان بڵێ: با دە سوورەتی وەك ئەم قورئانە بهێنن﴾ هود – ١٣.

وە لە سوورەتی یونس دا دەفەرموێ:﴿ ئەم قورئانە کەلامی خوایەو دان دەنێت بەوەی کە لە پێش خۆی دا هاتوەو درێژەی ئەو کتێبانەیە کە لە پێش خۆی دا هاتوون‌و ئەم کتێبە لە لایەن پەروەردگاری عالەمەوە هاتوەو هیچ گومانێکی تێدا نیە، نەخێر ئەوان دەڵێن: ئەمە درۆیەو محمد دروستیکردوە، پێیان بڵێ: دەی با سوورەتێکی وێنەی ئەم قورئانە بهێنن‌و بانگ بکەنە هەرکەس کەدەتوانن بێجگە لە الله ﴾ یونس – ٢٧-٢٨.

ئەمانە هەموویان لە مەکەدا هاتبوونە خوارەوەو چەندین مشتی بە هێز بون کەکوترا بونە دەمی بێ باوەڕان ، بەڵام وا ئێستا هاتوونەتەوە مەدینەو خوێندەوارییەکی زۆرگرنگی تێدایە چونکە جووەکان خۆیان بە خوێندەوار دەزانی‌و خۆیان بە ئەهلی کتێب دەزانی، بۆیە وا دووبارە ئایەت هاتە خوارەوەو مشتێکی تری بە هێزی سرەواندە ئەوانیش وهەمو گومڕاهان‌و خوا نەناسانی ترو بۆ هەمیشە دەمکوتی کردن، بە راستی بڕیاری ئاوەها تەنها لە توانای الله دا هەیەو کەس ناتوانێ شتی وا بڵێت چونکە دەگونجێت ئێستا کەسێك شتێك دروست بکات وێنەی نەبێت بەڵام ناتوانێت بڵێت کەسیش ناتوانێت وێنەی دروست بکات لەئایندەدا. چونکە لەوانەیە دروست بکرێت لەویش چاکتر. بەڵام الله دەفەرموێ: با بیهێنن وێنەی ئەم قورئانە.

(٢٤) جا ئەگەر نەیانتوانیوە تا ئیستا بهێنن‌و ناشتوانن لە مەو لاش بیهێنن، مادام ئێوە دەزانن کە ئەم قورئانە کەلامی خوایە، داواتان لێ دەکات کە تەنها الله بپەرستن‌و دژایەتی ئەم قورئانە نەکەن دەی بترسن لەو ئاگرەی کە مرۆڤو بەردسووتەمەنیەتی و ئامادە کراوە بۆ خوانەناسان. خەڵکینە ئێمە لە دنیادا ئەگەر بمانەوێ ئاگرێك بکەینەوە دەبێ شتی زۆر بێ هێز بهێنین وەك پووش‌و چیلکەو داری ورد تا ئاگرەکەی پێ بکەینەوە، بەڵام ئەو رۆژە بەمرۆڤو بەبەرد ئەو ئاگرە هەڵدەبێت، جا ئیتر ئەبێ ئەو ئاگرە چەند بەتین‌و سوتێنەر بێت. خوا پەنامان بدات ﴿لَن﴾ بۆ نەفی هەمیشەییە لە ئایندەدا، واتە لە داهاتوشدا ئەم شتە قەت

رووندادت و کەس ناتوانێت سورەتێکی بچوکی وەکو سورەتە بچوکەکانی ئەم قورئانە بهێنێت.

ئەوەتا زیاتر لە چوارده سەدەیە بە سەر هاتنی ئەم قورئانەدا تێپەڕیووەو کەسێك نەیتوانیوە سوڕەتێکی بچوکی وەك ئەم قورئانە بهێنێت. جا ئەو سورەتە با وێنەی سوڕەتی (**الكوثر**) بێت کە بچوکترین سوڕەتی قورئانە، جا چ لە بەر ئەوە بێت کە داڕشتنەکەی سەرسوڕهێنەرە، یان خوای گەورە وای کردوە ئەگەر کەسێك بیەوێت شتێك بلێت ناهێلێت، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿بێگومان کە ئێمەین ئەم قورئانەمان رەوانە کردوەو ئێمەش چاودێریی دەکەین﴾ حيجر:٩. بە هەر لایەکدا مانای بکەین هەر بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەم قورئانە فەرمودەی خوای خاوەن دەسەڵاتە.

خوای گەورە هەر خۆی بە چاکی مرۆڤ دەناسێت هەمیشە لە پاش باسی پیاوی خراپو دۆزەخەوە باسی پیاو چاكو بەهەشت، یان بە پێچەوانەوە دەکات، ئەوەتا لێرەش لە پاش باسی خراپانو سزاکانیان باسی چاکە کارانو پاداشتیان دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٥) ئەی محمدﷺ مژدە بدە بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە کە بۆ ئەوان هەیە چەندین باخچە کە لە ژێر ئەو باخچانەدا چەندین جۆگە لەهاتوچۆدایە لە ئاوی بە تامو لە شیرو لە شەراب نەك وەك شەرابی دنیا، وە جۆگەیەك لە هەنگوینی پاڵفتە کراو خۆ هەر کاتێك کە لە میوەکانی بەهەشتیان بۆ دێنن و رۆزیان پێ دەدەن دەڵێن: ئەمانەمان لە پێشدا بۆهاتوە، هەندێك دەڵێن: ئەو میوانە شێوەکانیان لە دنیادابینیوە وەك سێو، پرتەقاڵ، هەنار و.. کاتێ کە دەیبینن دەڵێن ئەمە هەنارو پرتەقاڵە، بەڵام کە دەیخۆن تامی ئەو نادات، هەندێك دەڵێن: ئەوەندە مێوەی رەنگاو رەنگی بۆ دێت بە لایەوە وایە کە ئەوەی خواردوە بەڵام کە دەیخوات دەزانێ کە نەیخواردوەو تامی ئەم میوەیەی تا ئێستا نەچەشتوە وەك دەفەرموێ: کە بۆیان دەهێندرا میوەکان لە یەك دەچون، وە بۆیان هەیە چەندین هاوسەری پاكو خاوێن کراوە لە هەر شتێك کە بێ تامو ناشیرینیان بکات لەو حاڵەتەی کە بۆ ژنان هەیە لە دنیادا، وە ئەوان بۆ هەمیشە لە ناو ئەو نازو نیعمەتو بەهەشتانەدانو لێیان ناسەندرێتەوە.

بەڵێ ئەم میوە جۆراو جۆرو فرەوانە ئەوخەڵاتە بەنرخە بۆ مرۆڤی موسڵمان ئامادە کراوە. بەڵام کام موسڵمان؟ ئەو موسڵمانانەی کە کرداری رێك وپێکیان ئەنجام داوە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە باوەڕی رووت بەبێ کردەوەی چاك بەرهەمی نابێت، هەروەك زانایان دەڵێن: " الإِيمَانُ مَا وَقرَ فِى القَلبِ وَصَدَقَهُ العَمَلُ/ باوەڕ ئەوەیە کە لە ناو دڵدا جێگیرببێتو کردار

وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ كُلَّمَا رُزِقُواْ مِنۡهَا مِن ثَمَرَةٖ رِّزۡقٗا قَالُواْ هَٰذَا ٱلَّذِي رُزِقۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَأُتُواْ بِهِۦ مُتَشَٰبِهٗاۖ وَلَهُمۡ فِيهَآ أَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞۖ وَهُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَسۡتَحۡيِۦٓ أَن يَضۡرِبَ مَثَلٗا مَّا بَعُوضَةٗ فَمَا فَوۡقَهَاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَيَقُولُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۘ يُضِلُّ بِهِۦ كَثِيرٗا وَيَهۡدِي بِهِۦ كَثِيرٗاۚ وَمَا يُضِلُّ بِهِۦٓ إِلَّا ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٢٧﴾ كَيۡفَ تَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَكُنتُمۡ أَمۡوَٰتٗا فَأَحۡيَٰكُمۡۖ ثُمَّ يُمِيتُكُمۡ ثُمَّ يُحۡيِيكُمۡ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ لَكُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَسَوَّىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖۚ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٩﴾

راستیەکەی بسەلمێنێت" ئا لێرەدا پێویستە ئیشارە بەوە بکەین کە زۆر کەس هەیە کە نوێژ ناکاتو رۆژوو ناگرێتو زەکات نادات، وە هیچ ئەخلاقێکی چاکی تێدا نیە، ئینجا دەڵێت من باوەڕم بە ﷲ هەیە تا خەڵك بەو بڵێن پیاوێکی باوەڕدارە؟! بەڵام لە راستی دا ئەگەر لەم قسانەیشی دا راست بکات ئەمە عیلمی بە خواو بە ئاخیرەت هەیە نەك باوەڕدارە واتە باوەڕەکەی باوەڕێکی شەیتانیە خوا ئەو باوەڕەی نەلە شەیتان ونەلەفیرعەون وەرنەگرتوە، جا تۆچیت لەوان زیاترە تا خوا لەتۆ وەربگرێت؟ (بە وردی تەماشای کۆتایی سورەتی صاد بکە).جا پاش ئەوەی کەخوای باڵادەستودانا بە نمونە ناوی هەندێك لە گیاندارانی باس کرد وەکو جاڵجاڵۆکە ومێش کە لە سوورەتی (عەنکبوتوحەج) دا هاتون بێ باوەڕان رەخنەیان دەگرتو دەیان وت ئەگەر ئەم قورئانە کەلامی خوایە، خوای گەورە چۆن بەو گەورەییەی خۆیەوە باسی مێشو ئەم شتە بێ نرخانە دەکات دیارە ئەمە کەلامی خوا نیە. لە راستی دا ئەم قسانە بەڵگەی جەهلو نەزانینە، چونکە رۆح مایەی ژیانی مرۆڤو هەمو گیان لەبەرێکی ترەو ئەو گیانەی کە بە مرۆڤێك دراوە هەر ئەو جۆرە گیانەیشە بە مێشوولەو مێروولەو باڵندە. ..وە....هتد دراوە ئەوەی کە وا مایەی شەرەفو رێزە بۆ مرۆڤ وبۆ هەمو گیان لەبەران ژیانەکەیەو ئەو روحەیە کە هیچ کەس تا ئێستا سەری لە بەر دەر نەکردوە، جا ئەگەر دەرك وشعور هەبێت ئەو گیانەی کە بە مێشوولەیەك دراوە هەر ئەو گیانەیە کە بە

حوشترێکیش دراوە هەردوو کیان بەو گیانە شتن ئیتر چ جیاوازیەك لە نێوان گیان لە بەراندا هەیە هەر لە مرۆڤەوە بگرە تا مێشێك هەردوو دروستکراوی خوادانو بەو گیانە ڕێزو ناویان دەبێت؟ کەواتە ئەگەر دەرك وعەقڵیان هەبوایە ئەم پرسیارانەیان نەدەکرد. جاالله لێرەدا وەڵامیان دەداتەوەو تێمان دەگەیەنێت کە ئەمە بۆچونێکی زۆر زۆر هەڵەیەو دەفەرموێ:

(٢٦) الله شەرم ناکات لە هێنانەوەی هەر نموونەیەك ئینجا مێشوولەیەك بێت یان لە سەروی مێشوولەوە بێت، چونکە هەمویان دروستکراوی خوای گەورەنو ئەو گیانی پێداون، ئینجا خوای زاناو کار بەجێ دەفەرموێ: خاوەن باوەڕان بە جۆرێك سرنج ئەدەنو ورد دەبنەوەو بێ باوەڕانیش بە جۆرێکی تر، جا ئەوانەی کە باوەڕیان هەیە دەزانن ئەم نمونانە، یان ئەم قورئانە حەقو ڕاستەولە لایەن خوای گەورەوە هاتوە بەڵام بێ باوەڕان دەڵێن: ئەم نموونەیە چ سودی هەیە کە الله باسی دەکات؟ زۆر کەسی پێ گومڕاە دەبێت. باوەڕدارانیش دەڵێن: نەخێر زۆری پێ هیدایەت دەبێتوەهەر فاسقان بەو گومڕا دەبن. کامانە فاسقن؟ ئینجا پێناسەیەکی فاسقانمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٧) ئەوکەسانەن پاش ئەوەی کە پەیمانی بتەویان لەگەڵ خوادا بەستوە هەڵیدەوەشێننەوەو ئەوەی کە الله دەستوری پێ داون کەبەیەکەوەی بلکێننو بتەوی بکەن، دەیبچڕن وەك پەیوەندی خزمایەتی، وەلەسەر زەویدا خراپەبلاو دەکەنەوە ئەوانە هەرخۆیان زیان لێکەوتو ڕەنجەڕۆن. ئەم فیسقو دەرچون لە سنورە بەڵگەی نەبونی باوەڕە بە قیامەت وبە زیندوو بونەوە بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ:

(٢٨) چۆن ئەوانە بێ باوەڕن بەخواو لە بەرچی بێ باوەڕن؟ لە بەر ئەوەی کە دەڵێن: کە مردین ئیتر زیندو نابینەوە. خۆ ئێوە مردوبون زیندوی کردنەوەو گیانی پێدان لە پاشدا دەتان مرێنێو دەچنەوە بۆ جیهانی بەرزەخو ژیانی ناو گۆڕو حیسابەکەی، لە پاش ئەو مەرگە زیندوتان دەکاتەوە، لەپاشان هەر بۆلای ئەودەبرێنەوەبۆ تەواوی لێ پرسینەوەوسزاوپاداش.

واتە مرۆڤ دروستبوە لەو دلۆپە ئاوەی کە لەو خۆراکەی کە مرۆڤ بەهەردوو ڕەگەزیەوە دەیخوات، دیارە ئەو خۆراکە ئەگەر حەیاتیشی تیدا بێت وەك گیاوو شتی تر، بەڵام ئەمەش پاش ئەوەی کە دەکرێت بە شێوو بە خواردەمەنیو گەدە، شی دەکاتەوەو وردو ڕێزاڵ ڕێزاڵ دەبێت، ئیتر ئەو حاڵەتەیشی تیدا نامێنێت، واتە: مردویەکی بەتەواوی مردوە جا دەبێت بە دلۆپەئاوێکی خەست، ئینجا خوای دانا چەندین حەیوانی زیندو لەناو ئەو دلۆپە ئاوەدا دروست دەکات، ئینجا بەتێکەڵ بونی ئەودلۆپە ئاوە لەناو منداڵداندا بەفەرمانی الله مرۆڤی لێ دروست دەبێت، کەواتە لەسەرەتادا ئێوە مردو بوون ئێستاش دەبینن کەچۆن دروستیکردوون، وەدەبینن کەدەتان مرێنێ دەی خۆ ئەگەر ژیربن دەبێ زیندوبونەوەی دووهەمتان بەلاوە ئاسان تربێت.

(٢٩) جا ئەو زاتە ئەو کەسەیە کە ئەوەی لەسەر زەویدایە هەموی بۆسودو بۆ بەرژەوەندی ئێوە دروستکردوە، لەپاشان ئیرادەی دروستکردنی ئاسمانی کرد، ئەوسا گورج بەماوەی دووڕۆژ ئەو حەوت ئاسمانەی ڕێك خست، وە خوای گەورە عیلمی بە هەمو شتێك هەیە لە هەر کوێدا هەبێت گەورە یان بچووك.

ئەمە یەکێکە لەو عامانەی کە تایبەت نەکراوە چونکە عام هەیە تایبەت کراوەو عامیش هەیە هەر بە گشتی خۆی ماوەتەوە لەوانە ئەم ئایەتانە ﴿ وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ /الحديد: ٣/ وە ئەو زانیاری بە هەمو شتێك هەیەو هیچ شتێك لە عیلمی ئەو دەرناچێت ﴾

﴿فرەوان ترە کورسیەکەی لەئاسمانان و زەوىو پاراستنیان لەلای ئەو سەخت نیەو هەر خۆیەتی بلند مەقامو گەورە﴾بەقەرە:٢٥٥.

جا کەواتە چی لێ پەنهان دەکرێت؟ ئەمە باسێك بوو بۆ ئەوەی کەمێك تەماشای دەوروبەرمان بکەینو سەرێك هەڵبڕینو هەندێك لەو نیعمەتانەی کە الله بۆی دروستکردوین ببینین، ئەوسا الله بناسینو سوپاسی بکەینو ڕوو بکەینە ئایینەکەی. ئینجا خوای گەورە سەرەتای دروستبونی خۆمانمان بۆ باس دەکاتودەفەرموێ:

(٣٠) ئەی محمدﷺ باسکە بۆیان ئەو کاتەی کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی فەرمو: بێگومان من لەم زەویەدا جێنشینێك دادەنێم، ئینجا ئەوانیش وتیان: ئەی خوایە کەسێك دادەنێی لەسەر ئەم زەویەدا کە خراپەی تێدابکاتو خوێن ڕێژی بکات؟ بەڵام خۆ ئێمە لەگەڵ سوپاسو پێزانینی نیعمەتەکانت تەسبیحاتی تۆدەکەینو بە ڕێزت دەگرینو نوێژت بۆ دەکەین؟ لەم جێنشینە دا ئیختلاف بوە لە نێوان زانایاندا، هەندێك پێیان وایە: کە ئەم جێنشینە لە وەکالەتی خواوەیە واتە: ئەو دەسەڵاتو عەداڵەتەی کە خوا هەیەتیو لە کتێبەکانی دا باسی کردوە دەیەوێت لەسەر زەویدا کۆمەڵێك ببنو جێ بە جێی بکەن.وە هەندێك ئەم شێوە تەفسیر کردنەیان بە لاوە جوان نیە، بەڵکو بە جێنشینی میللەتانی پێشوی دەزانن یان خۆیان چین لە پاش چین جێگای یەکتر دەگرنەوە.

ئەم پرسیارەی فریشتەکانە پرسیارێکە بۆ زانین نەك بۆئینکاری، بەڵکو بۆ زانینی سودی دروستبونی ئەم مرۆڤانەیە واتە دەڵێن:

ئەی خوایە سوودی ئەم مرۆڤ چیە؟ بەڵام پرسیاری شەیتان ئینکاری بوو بۆیە شەیتان نەعلەتی لێ کرا.

باشە مەلائیکە چۆن دەیانزانی کە مرۆڤ ئاوا دەکات؟ دەگونجێ بەم شێوەیە بێت لە بەر ئەوەی کە لە جۆری مرۆڤ بووبێت لە پێش ئادەمداو وایان کردوە یان سروشتی زەوی وایە کە هەر کەسێك دێتە سەری وا دەکات، یان لە (**لوح ا فوظ**) بۆیان ئاشکرا کراوە کە مرۆڤ لە ئایندەدا وا دەکات، یان ئەم مرۆڤە لە خاك دروست بووەو سروشتی خاکیش ئاوەهایە.

خوای گەورە دەفەرموێ: من شتانێك دەزانم کە ئێوە نایزانن. ئەوەتە ئەو مرۆڤانەی کە مایەی سەرسوڕمانی فریشتە بون، ئەو هەمو پێغەمبەرو پیاو چاكو شەهیدو ئەو زانا بەرزانەی لێ هەڵکەوتووە بە ملیارەها مرۆڤ خۆی لە پێناوی دینی الله دا فیدا کردووە دەیکات، بەڵام مەلائیکە وا دروستکراون کە بە بەردەوامی عیبادەتی خوا بکەنو ئارەزواتی تریان تێدا نیە، بەڵام مرۆڤ کە خاوەنی ئەو هەمو ئارەزۆو شەهەواتەیەو چاوی لە هەموی بنووقێنێتو رو بکاتە ئاینەکەی الله و سەبر لەسەر ئەو هەمو سەختیو تەنگانە بکات، ئاشکرایە کە دەرەجەی زۆر بەرز دەبێتو پلەو پایەی لە فریشتە گەورەتر دەبێت. خوای گەورە لێرەدا تاقیکردنەوەیەك دەکات بۆ ئەوەی کە تێیان بگەیەنێت کە ئەوەی خوای گەورە دەیزانێ ئەوان نایزانن.

(٣١) جا ئەوەی کە ناو بێتو پێویست بێت لەو سەردەمەدا خوای گەورە بە ئادەمی راگەیاندو فێری کرد، لە پاشان ئەو شتانەی هێنایە بەر چاوی فریشتەکانو پرسیاری لێ کردنو فەرموی: ئەگەر ئێوە راست دەکەنو پێتان وایە هەمو شتێك دەزانن‌و عیلمتان بە هەمو شتێك هەیە ناوی ئەوانەم پێ بڵێن.

(٣٢) وتیان: پاكو بێ عەیبی بۆتۆ خۆ ئێمە هیچ زانیاریەکمان نیە تەنها ئەو زانیاریە نەبێت کە خۆت فێرت کردوین بە راستی تۆ زۆر زانایتو ئیشەکانت بە حیکمەتن.

(علیم) صیغە موبالغەیە واتە زۆر زاناو ئاگا، ئەم ناوەی پەروەردگار کە وەسفی عیلمی پەروەردگار دەگەیەنێت لە قورئاندا سەدوشەش جار بە شێوەی ﴿ عَلِيمٌ ﴾ کە هەژدە جاری لەم سورەتەدایە وە سیو دووجار بە ﴿ ٱلۡعَلِيمُ ﴾ کە سێ جاری لەم سورەتەدایە هاتوە، وە بیستو دووجاریش بە ﴿ عَلِيمًا ﴾ هاتوە.

(حکیم) واتە کاربەجێ، ئەو زاتەی کە هەمو بڕیارو ئیشەکانی لەسەر بناغەی عیلمو حیکمەتە، ئەم ناوەی پەروەردگار کە وەسفی حیکمەتی پەروەردگار دەگەیەنێت لە قورئاندا سێ‌ونۆ جار بە شێوەی ﴿ حَكِيمٌ ﴾ کە پێنج جاری لەم سورەتەدایە وە چلو

وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ خَلِيفَةٗۖ قَالُوٓاْ أَتَجۡعَلُ فِيهَا مَن يُفۡسِدُ فِيهَا وَيَسۡفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحۡنُ نُسَبِّحُ بِحَمۡدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَۖ قَالَ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٣٠﴾ وَعَلَّمَ ءَادَمَ ٱلۡأَسۡمَآءَ كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمۡ عَلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ فَقَالَ أَنۢبِـُٔونِي بِأَسۡمَآءِ هَٰٓؤُلَآءِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ لَا عِلۡمَ لَنَآ إِلَّا مَا عَلَّمۡتَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣٢﴾ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ أَنۢبِئۡهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡۖ فَلَمَّآ أَنۢبَأَهُم بِأَسۡمَآئِهِمۡ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَأَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا كُنتُمۡ تَكۡتُمُونَ ﴿٣٣﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ وَٱسۡتَكۡبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٣٤﴾ وَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ ٱسۡكُنۡ أَنتَ وَزَوۡجُكَ ٱلۡجَنَّةَ وَكُلَا مِنۡهَا رَغَدًا حَيۡثُ شِئۡتُمَا وَلَا تَقۡرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٥﴾ فَأَزَلَّهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ عَنۡهَا فَأَخۡرَجَهُمَا مِمَّا كَانَا فِيهِۖ وَقُلۡنَا ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ ﴿٣٦﴾ فَتَلَقَّىٰٓ ءَادَمُ مِن رَّبِّهِۦ كَلِمَٰتٖ فَتَابَ عَلَيۡهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٣٧﴾

دووجاریش بە ﴿ ٱلۡحَكِيمُ ﴾ کە دوو جاری لەم سورەتەدایە هاتوە، شانزە جاریش بە ﴿ حَكِيمًا ﴾ هاتوە، کۆتا شوێنێکیش لە قورئان کە ئەم دوو ناوە هاتبێت ئایەتی سیهەمی سورەتی "ئینسانە".

ئەم دوو ناوە لە قورئاندا بە شێوەکانیانەوە بیستو نۆ جار پێکەوەهاتون وەك ﴿ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾

(٣٣) ئەی ئادەم ئەو ناوانەیان پێ بڵێ، جا کاتێ کە ئادەم ناوەکانی پێوتن فەرموی: ئەی من پێم نەوتن کە من هەمو نهێنیەکانی ئاسمانو زەوی دەزانم؟وە من ئاگادارترم لەخۆتان بەوەی کە ئاشکرای دەکەنو ئەوەش کەدەیشارنەوە، ئاگادارە لە هەمو شتێك.

واتە ئادەم بوو بە مامۆستای فریشتەکانو واخەریکە شتیان فێر دەکات بەو شێوەیە ئەوان مافی خۆ بە گەورە زانیان بەسەر ئادەمدا نەما، بەڵێ هەر بەم مامۆستایەتی ئادەمە بۆمان دەردەکەوێت کە بەرەی مرۆڤ ئەمڕۆ لە عیلم دا بە هەر کوێ بگات هێشتا هەر لە دواوەیە چونکە خوای گەورە کە مرۆڤی دروستکردوە، عیلمو زانستی وای پێداوە کە فریشتەکان لە لای دەرس بخوێنن، لێرە پرسیارێك دێتە پێشەوە حەز دەکەم بیزانن.

دەڵێن: خوای گەورە ئادەمی فێری ناوەکان کردو بە فریشتەکانی نەوت، ئەگەر الله بە فریشتەکانیشی بفەرموایە ئەوانیش دەیانزانی کەواتە زیرەکی ئادەم لە مەدا چی بوو؟ لێرەدا من وای بۆ دەچم کە مەسەلەکە ئەوەیە کە چۆن الله ئادەمی تێ گەیاند.

ئەوان فریشتە بونو پێیان وا بو کەلەبارەی ئادەمەوە هەمو شتێك دەزانن، ئادەم لە جێگای تایبەتی خۆیداو فریشتە لە بەینی خواو ئادەم دا زۆرو زەبەنەو چۆن چۆنی بو کە ﷲ ئەم ناوانەی بە ئادەم پیشان داو ئەوان ئاگایان لێ نەبو؟! بەڵێ ئەو عیلمەی کە خوا هەیەتی زۆر زۆر لە سەروی عیلمی ئەوانەوەیە، ئیتر ئەوانە حەقیانە رێز لە ئادەم بگرن، وە لە سەرئەم بناغەیشە مرۆڤ بە گشتی لە فریشتە گەورەترەو پێغەمبەرانی مرۆڤ لە پێغەمبەرانی فریشتە گەورەترن، هەروەها دەڵێن کە جبرائیل کە نێردراوی خوایە بۆ لای پێغەمبەران لە کاتی معراج دا لەپلەو پایەی خۆی تێ نەپەڕیو وتی: ئێمە مەقامی دیاری کراومان هەیە. کەچی پێغەمبەرﷺ بۆ سەروتر بەرەو خوا جل جلاله رۆیشت. ئێمە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە بەرەی ئادەم بە گشتی لە فریشتە گەورەترن، بەڵام پێویستە ئەمە بزانین کە فریشتە هەمویان چاکە کارنو لە بەرەی ئادەم دا ئەوانەی کە لە بەرنامەی ﷲ لادەدەن ئەوانە پیسترین مەخلوقی خودانو لەهەمو ئاژەڵێك پەستو بێ نرخ ترن. بەرەی ئادەم دوو بەشن چاکە کارانی بەرەی ئادەم ئەوەندە بەرێزن ﷲ دەفەرموێ:

(٣٤) بیرکەرەوە لە ئەو کاتەی کە ئەمرمان بە فریشتەکان کرد کەسوجدە بەرن بۆ ئادەم، جا ئەوانیش سوجدەیان برد، جگە لە شەیتان کە خۆی گرتو خۆی بە گەورە داناو سوجدەی نەبردو لە فریشتەکان نەبو هەر لە زوەوە لە ریزی کافران دا بو، بەڵام خۆی لە قاڵبێکی دینداردا پێشان دەدا تابەوشێوەیە تارێنرا.

لە مەیشەوە جارێکی تر دەرکەوت کە ﷲ زانیاریەکی وای لەسەر شەیتان بوە کە فریشتەکان نەیانزانیوە لە پێشدا پێیان وابو کە شەیتان پیاوێکی چاکە، بەڵام ﷲ دەیزانی کە وانیەو خراپە، ئەوەتا لە داستانی ئادەم دا دەرکەوت کە بەندەیەکی خراپەو ئەوان پێیان نەدەزانیو لەگەڵ ئەوانیش دا هەڵسوکەوتی دەکرد بەڵام دەرنەکەوت تا ئادەم دروستبو، کە ئادەم دروستبو لە بەر حەسادەتو خۆ بە زل زانین خۆی پێ نەگیراو ئەو کوفرەی ناو دەروونی دەرخست.

لە شوێنی تریش قورئان بۆمان باس دەکات کە شەیتان کاتێ ئەم کارەی کرد بەر نەفرینو نەعلەتی خوا کەوتو لە بەهەشت دەرکراو هەتا ئەو رۆژەی کە خەڵك دەمرێت مۆڵەتی پێ دراوەو ئەویش سوێندی خواردوە کە مرۆڤ لادەدات لەسەر رێگای راست، بەڵام مرۆڤی چاکی پێ ناخەڵەتێت، جا ئاوا بەم شێوەیە نەفەرەکانی خۆی کۆ دەکاتەوەو جهەنەمیان پێ پڕ دەکات.

جا ئەو خاڵەی کە جێگای ورد بونەوەیە ئەوەیە کە ئێمە وەکو باوەڕدارێکی راست بە شێوەی پێویست تەبلیغاتی دینی ﷲ ناکەینو لە خوا ناترسین، جا ئەگەر هەندێك ئیشی کەمیش بکەین زۆر خۆمانی پێ هەڵدەکێشین، زۆر جاریش فەرمانی ﷲ دەشکێنین وە بە خەیاڵماندا نایەت کە چی ئەو شەیتانە بەو هەمو سیفەتانەو لە ناو مەلائیکەدا چەند بەرێزو بەرز بو، ئینجا بە یەك نافەرمانی ﷲ دەرکرا لەو نازو نیعمەتەو نەفرینی هەتا هەتایی بەرکەوت،

جا بۆیە ئێمەی موسڵمان پێویستە لە خۆمان بپرسین بۆ ئەوەندە لە خۆمان بایین. موسڵمانی راستو دروست﴿هەمیشە بەترسو بەتەماعەوە خواپەرستی دەکەن﴾ دەفەرموێ: ﴿دەیکەن لەچاکە ئەوەی کە دەیکەن لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر دڵیان دەترسێ لەوەی کە ﷲ لێیان وەر نەگرێ﴾

چونکە هەموی بایی چاوێکمان نابێت، وە نرخی یەك هەناسەی ئێمە نیە، کاتێك کە یەك هەناسەمان دێتە دەرەوە ئەگەر خوای گەورە ئیرادە نەکات نایەتە دەرەوەو دەخنکێین وە ئەگەر هاتو نەگەڕایەوە خۆ ئیتر گیانمان دەرچوە، واتە: ئێمە بۆ دەرچونی هەر هەناسەیەك پێویستە سوپاسی ﷲ بکەین، وە بۆ هەر هەناسەیەك کە وەری دەگرین سوپاسێکی تر پێویستە، وە لەسەر ئەو سوپاسەش پێویستە سوپاسی ﷲ بکەین چونکە ئەگەر ﷲ یارمەتیمان نەدات ناتوانین ئەو سوپاسەیش بکەین.

بەڵێ راستە کەدەفەرموێ: ﴿ ئەگەر بتانەوێ نیعمەتەکانی ﷲ بژمێرن ناژمێرێ بۆتان﴾ جا هەر ناتوانین بیژمێرین چ جای شوکری بکەین. با بیر لە حاڵی خۆمان بکەینەوەو شوکری ﷲ بکەین تا خوای گەورەش نیعمەتەکانی خۆی زیاد بکات بۆمان. وەك دەفەرموێ: ﴿بەراستی ئەگەر ئێوە شوکرانە بژێرن، منیش رۆزیتان بۆ زیاد دەکەم﴾

لە بارەی ئەوەی کە دەڵێن شەیتان لە مەلائیکەیە یان لە جنۆکەیە ئیختیلاف هەیە، هەندێك دەڵێن: شەیتان لە جنسی مەلائیکە نیە لە جنۆکەیەولە ئاگر دروستبوە، وە دەست دەگرن بەم ئایەتەوە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِـَٔادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ ... /الكهف: ٥٠/ وە ئەو کاتەی کە بە فریشتەکانمان وت سوجدە بەرن بۆ ئادەم جا سوجدەیان برد جگە لە شەیتان کەئەو لە جنۆکە یە﴾

هەندێکیش دەڵێن: نەخێر بەشێکە لە مەلائیکەو لە جنسی ئەجینەن، ئەو بەشە مەلائیکە لە ئاگر دروستبوە، بەڵام ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە کە ئەو کاتە شەیتان لە ناو فریشتەکاندا بووەو خیتابەکەش ئاراستەی ئەو کراوە کە سوجدە ببات، بەڵام سەرکەشی کردووە بە بۆنەی ئەو سەرکەشی یەوە لە بەهەشت دەرکراوە.

(٣٥) جا وتمان: ئەی ئادەم خۆتو هاوسەرەکەت لەناو ئەم بەهەشتەدا ئارام بگرن، لە هەر جێگایەکی ئەو بەهەشتەدا کە ئارەزۆتان لێی هەیە بگەڕێنو بخۆن بەلێشاوی چۆن ئارەزۆ دەکەنو لە کام دەتانەوێ بیخۆن، بەڵام نزیکی ئەو درەختە نەکەون، کە درەختێکی ناسراوو دیاری بو لەلایان، جا ئەگەر لەو درەختە نزیك کەوتنەوەو سودتان لێ وەرگرت ئەو کاتە خۆتو هاوسەرەکەت لەستەمکارانن.

پێشەکی ستەمتان لە خۆتان کردوە. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کەهەر کەس بێ فەرمانی خوای کرد پێشەکی زوڵمی لە خۆی کردوە چونکە زیانەکەی پێش هەمو کەس بۆ خۆیەتی.

وشەی **(سکن)** بەوجێگایە دەڵێن کە تێیدا دادەنیشن لە **(سکون)**ـەوە هاتوە واتە ئارام گرتن.

(٣٦) جا شەیتان هەڵیخلیسکاندنو فریوی دانو لەناو ئەو هەمو نازو نیعمەتە دەری پەڕاندن، جا وتمان: دابەزن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن، ئەوساجێگەی وەقرەگرتن و رابواردنی ئێوە لەسەر زەوی دایە، تا ماوەیەك. ئەم ماوە کە تەمەنێکی چەند ساڵەیەو لە پاش ئەم چەند ساڵە بمانەوێو نەمانەوێ دەبێ بنەو بارگەمان بپێچینەوەو ئەم زەوییە بە جێ بهێڵین، لە کۆتایشدا ئەم زەوی وئاسمانە تێك دەچێتو نەوەی ئادەمو هەمو گیان لەبەرانی تردەمرنو کەس نامێنێو مرۆڤ دەبێ هەموی لەسەر ئەم زەوییەدا کۆچ بکات،

بەڵێ کاتێ کەبەقسەی شەیتان فەرمانی خوایان شکاندو بەری درەختەکەیان خوارد پۆشاکیان لەبەردا نەماو شەرمگەیان دەرکەوت، جا پەلاماریان دایە گەڵای درەختەکانی ئەو بەهەشتەو خۆیان پێداەپۆشی واتە: جلو بەرگیان نەما ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەتاوان سەرەرای ئەوەش کە مایەی شەرمەزاری دنیاو سزای قیامەتە کاردەکاتە سەر پۆشاكو رۆزیش هەروەك خوای گەورە لە قورئاندا بە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ﴿ ئارام بگرە لەسەر ئەو نوێژەی کە دەیکەیو بەردەوام بە لە سەری، ئێمە داوای رۆزی لە تۆ ناکەین بەڵکو ئێمە رۆزی بە تۆ دەدەین﴾ تاها:١٣٢

کەواتە دەوام کردن لەسەر عیبادەتی خوا رۆزی زیاد دەکاتو تەرکی عیبادەت بە پێچەوانەوەیە، ئەوەبو ئادەم لە ناو ئەو هەمو نازو نیعمەتانەدا بو بەڵام کاتێ کە گوناهی کرد ﷲ دەری کرد.

ئەی خەڵکینە خوای گەورە کاتێ کە باسی داستانێکمان بۆ دەکات بۆ ئەوە نیە کە ئێمە بخەوین، بەڵکو بۆ ئەوەیە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرین کەئەمەش لوتفێکی تری خوایە لەگەڵ مرۆڤدا دەیکات بەڵکو بیر بکەنەوە، ئەگینا نیعمەتی ﷲ فرەوانە تەنانەت بۆ بێ باوەڕانیش؟ ئادەمێك کە خوا بە دەستی قودرەتی خۆی دروستیکردوەو بە مەلائیکەی ئەمر فەرمو کە سوجدەی بۆ ببەنو تەنها شەیتان سوجدەی بۆ نەبرد ﷲ دەری کرد لە ناو مەلائیکەتانداو بەتەواوی رسوای کرد. ئەو ئادەمەش کاتێ کە نا فەرمانی خوای کرد لەو هەمو نیعمەتانە دوور خرایەوە، بەڵام چونکە پەشیمان بویەوە لەوەی کە کردی خوای میهرەبان چاوپۆشی لێ کردو کردی بەپێغەمبەریش (علیەالسلام).

جا ئێمەش کە نەوەی ئادەمین حەق وایە لەم داستانە پەند وەربگرینو بزانین کە تاوان ئاوا ریسوامان دەکات، چاکەش خێروبەیرمان بۆزیاد دەکات، جا ﷲ دەری کردن لەو نیعمەتانەی کە تێیدا بون، جا پێمان وتن دابەزن، بڕۆن بۆ خوارەوە هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن، دیارە ئادەمو حەواو شەیتان هەمویان دابەزین هیچکامیان لەوێدانەمانو شەیتان دوژمنی بەنی ئادەمە هەتا قیامەت. هەروەها مرۆڤەکان بە بۆنەی شەیتانەوە هەندێکیان دەبن بە دوژمنی هەندێکی تریان واتە بەهەڵنانی شەیتان هەمیشە بەرەی ئادەم لە یەك دەخوێننو ناکۆکن ئایەتەکە هەردووك مانا هەڵدەگرێتو هەردوویشیان راستە شەیتان هەرگیز ئاشتی لەگەڵ بەنی ئادەمدا ناکات تا رۆژی قیامەتو هەمیشە خەریکی دروست کردنی ئاشۆبو ناکۆکیە، بە داخەوە زۆربەی نەوەی ئادەمیش دڵی شەیتان ناشکێنن! هەندێك دەڵێن: کەئەمانە پێکەوە نەهاتنە خوارەوە ئادەم کەوتە سەر زەوی هیندو حەوا کەوتە سەر زەوی حیجاز، ئینجا هەستیان کرد کە تاوانو خراپەیان کردوەو لە فەرمانی خودا دەرچوون، بۆیە وا کەوتنە ئەم رۆژە رەشەوەو دانیان بە هەڵەی خۆیاندا نا، ئەوسا سۆزو میهرەبانی ﷲ ئەوانی گرتەوەو تەوبەی لێ وەرگرتنو رێنمایی کردن کە چی بڵێن، وەك دەفەرموێ:

(٣٧) ئەوسا لە لایەن خوداوە ئادەم چەند وشەیەکی پێگەیشتو تێیگەیاند کە بەو چەند وشانە بپاڕێتەوە، بە راستی ئەو هەر خۆیەتی زۆر تەوبە وەرگرو زۆریش بە رەحمو میهرەبانە.

جا ئادەمیش جارێکی تر هاتەوە سەر راستە شەقامو بە دڵێکی پاکەوە رێنماییەکانی پەروەردگاری ئەنجام داو تەوبەی کرد ئەوسا خوداش ئەوتەوبەیەی لێ وەرگرت وکردی بەپێغەمبەریش علیەالسلام ، ئەم بەسەر هاتە وای کرد کە ئادەم بزانێ کە دوژمنی هەیە و دوژمنەکەیشی هەمو فرتو فێڵو درۆیەك بەکاردەهێنێت بۆ ئەوەی لە خشتەی بەرێت.

**(تواب)** واتە زۆرتەوبە وەرگر، ئەو زاتەی کە بەندەکانی چەندە تاوان بکەن مادام بگەڕێنەوەو تەوبە بکەن لێیان وەردەگرێت، ئەم ناوەی پەروەردگار لە قورئاندا بە شێوەکانیەوە دوانزەجار هاتوە،

قُلْنَا ٱهْبِطُوا۟ مِنْهَا جَمِيعًا ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَن تَبِعَ هُدَاىَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٣٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَوْفُوا۟ بِعَهْدِىٓ أُوفِ بِعَهْدِكُمْ وَإِيَّٰىَ فَٱرْهَبُونِ ﴿٤٠﴾ وَءَامِنُوا۟ بِمَآ أَنزَلْتُ مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوٓا۟ أَوَّلَ كَافِرٍۭ بِهِۦ ۖ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّٰىَ فَٱتَّقُونِ ﴿٤١﴾ وَلَا تَلْبِسُوا۟ ٱلْحَقَّ بِٱلْبَٰطِلِ وَتَكْتُمُوا۟ ٱلْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤٢﴾ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرْكَعُوا۟ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ۞ أَتَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ ٱلْكِتَٰبَ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٤٤﴾ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا لَكَبِيرَةٌ إِلَّا عَلَى ٱلْخَٰشِعِينَ ﴿٤٥﴾ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُوا۟ رَبِّهِمْ وَأَنَّهُمْ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿٤٦﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿٤٨﴾

کۆتا شوێنێکیش لە قورئان دا کە ئەم ناوەی تێدا هاتبێت ئایەتی سێهەمی سورەتی "نصره".

﴿ٱلرَّحِيمُ﴾ واتە زۆر بەرەحمو میهرەبانەو ئەوزاتەی کە سۆزو بەزیی دەنوێنێت بۆ بەندەکانی بەتایبەت بۆ باوەڕداران، ئەم ناوە لە قورئاندا بەشێوەکانیەوە سەدوپانزە جار کە دوانزە جاری لەم سورەتەدایە هاتوە بەڵام لە ئایەتی سەدوبیستو هەشتی تەوبە ئەم وەسفە بۆ پێغەمبەرمان بەکار هاتوە، کۆتا شوێنێکیش لە قورئان دا کە ئەم ناوەی تێدا هاتبێت ئایەتی بیستەمی سورەتی "موزەمیلە".

ئینجا لەسەر ئەم وشانە ناکۆکی هەیە هەندێك دەڵێن: ئەوەبو کە ئادەم فەرموی: خوایە ئایا تۆ منت دروست نەکردوە؟ ئایا لە روحی خۆتت پێ نەداوم؟ فەرموی: بەڵێ، ئینجا ئادەم فەرموی: داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم. وە هەندێکی تر دەڵێن: ئایەتی بیستوسێی ئەعرافە کەدەفەرموێ: ﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ / ئەو دووانە وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئێمە لەخۆمان ستەممان کردوە و ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبیتو رەحممان پێ نەکەیت بەدڵنیاییەوە ئێمە لەزیان لێ کەوتوانین﴾

بەراستی ئەم داستانەی ئادەمو بەهەشتو دوژمنی شەیتانە وانەیەکی زۆر گرنگی کردوەیی بو بۆ ئادەم، تا دوژمنی راستەقینەی خۆی بناسێتو چاوو دڵو مێشكو دەرونی بکاتەوەو ئاگای لە خۆی بێت، ئەوە بو کە ئیتر بەرهەڵستی مرۆڤ گەیشتە ئەو پلە بەرزەی کە بە هەزاران پێغەمبەرو بە ملیار شەهیدو پیاو چاکی لێ هەڵکەوتوە، واتە: ئادەم علیه‌السلام ی دروستکراو بۆزەوی وا بە کۆمەڵێك لە زانیاری پێویستەوە بۆ جێنشینی دابەزیو ﷲ فەرموی:

﴿٣٨﴾ وتمان هەموتان دابەزن جا هەر کاتێك لە لایەن منەوە رێنمایی‌و بەرنامەتان بۆ هات ئەو کاتە ئەو کەسەی کە پەیڕەوی رێنمایی منی کرد سا ئیتر ترس مانای نیە بۆ ئەوان‌وئیتر خەم ناخۆن. ئەمە ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە ترس نابێ لە دڵو دەرونی خاوەن باوەڕاندا جێگای ببێتەوەو نابێ بترسن، لێرەدا پێویستە ئەوە بلێین کە ترسان دوو بەشە: بەشێکیان چاکەو حەقە ببێت کە بریتیە لە ترسان لە خوای خاوەن دەسەڵات، بەشەکەی تر قەدەغەو تاوانە کە بریتیە لە ترسان لە غەیری ﷲ کە رۆژی یان تەمەنت کەم کاتەوە ئەوەش بزانە کە ترسانی فیتری بە تاوان ناژمێردرێت وەك ترسان لە مار یان خۆشاردنەوە لە گوللەو دوژمن، بەڵام ئەبێ باوەڕی هەبێت کە کاریگەری سەرەکی تەنها خوایەو بەبێ خواستی ئەو مو لە مو ناترازێت. مەبەستی ئەم ئایەتە بەشی دووهەمەو هەر خوایش زانایە. جا کەسێك کە رێگای هیدایەتی گرت با نەترسێ لە شەیتان‌و باقی دوژمنانی ﷲ کە مرۆڤن چونکە ئەوانە ناتوانن یەك تۆز لە رزقی کەم کەنەوەو ناشتوانن هیچی بۆ زیاد بکەن، وە ناتوانن ئەجەلی بێننە پێشەوەو ناشتوانن تەمەنی مرۆڤ درێژ بکەنەوە. خۆ ئەگەر بیانەوێ زیانی لێ بدەن یان سودی پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر شتێك ﷲ خۆی قەراری دابێت. بەڵێ بە راستی ئەو کەسانەی کە بەڕاستی رێنمایی‌و بەرنامەی خوایان وەرگرت ئاوا لەو هەمو پەرستراوە هیچو پووچانە رزگاریان دەبێ‌و خۆی بە ئازادو سەرفەراز دەزانێ‌و لە لای خوایش هەر وایە.

﴿٣٩﴾ بەڵام ئەو کەسانەی کە کافرو بێ باوەڕن ببن بە نیشانەکانی ئێمە ئەوانە هاوڕێ‌و دۆستانی دەستەملی ئاگرن‌و بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو رۆژێ لە رۆژان رزگاریان نابێت.

جائاشکرا بو کە تەنها دوو رێگا هەیە. رێگای راستو رێگای چەوت، تەنها دوو بەرنامە هەیە حەق‌و ناحەق، ئەگەر پەیڕەوی رێگای حەق بوین ئەوە چاکەو پاداشەکەشی بەهەشتە، ئەگەر پەیڕەوی رێگای راست نەبوین ئیتر گومڕاهیە و سزاکەیشی دۆزەخە وەك دەفەرموێ: ﴿ پاش راستی بێجگە لە گومڕاهی شتێکی تر نیە﴾یونس: ٣٢.

﴿٤٠﴾ئەی کوڕانی یەعقوب، بیر بکەنەوە لەو نیعمەتانەی من کە رژاندم بە سەرتاندا کە گەورەترینیان رزگار کردنتان لە فیرعەون

بو، وە بەو وەعدو پەیمانەی کە داوتانە بە من وەفا بکەن منیش وەفا دەکەم بەو عەهدەی خۆم کە داومە بە ئێوە،وە تەنها لە من بترسن. واتە ئەی کوڕانی بەندەی صاڵحی خوا ئا بەم ناوە جوانە بانگیان دەکات تا بەڵکو کەمێك بیر بکەنەوە لە حاڵی خۆیانو لەو سەرکەشیو خراپەکارییە واز بهێنن، دەڵێن ئەو عەهدو پەیمانەی کە لە تەوراتو ئینجیل دا بۆیان باس کراوە کە ئەگەر ئێوە پەیڕەوی دینی ﷲ تان کرد منیش خۆشبەختی دنیاو قیامەتتان دەدەمێ. لێرەدا دەبێ دیقەت بکەین کە ﷲ نەیفەرموە ﴿ فَارْهَبُو ﴾ لە من بترسن بەڵکو فەرمویەتی: ﴿ وَإِيَّىَ فَارْهَبُونِ ﴾ پێش خستنی مەفعولەکە کە﴿ وَإِيَّىَ ﴾ بۆ حەسرە واتە تەنها لە من بترسن.

(٤١) ئەوسا باوەڕ بێنن بەوەی کە من دام بەزاندوە بۆ پێغەمبەر کە قورئانە ، کە ئەو قورئانە دان دەنێ بەوەی کە لە لای ئێوەیەو دژی نیەو دەڵێ کاتێ خۆی شتێکی ڕاستو حەق بوە، بەڵام ئێستا گۆڕیوتانە، سوەلەناو گاورو جولەکە دا ئێوە یەکەم کافر مەبن بەم قورئانەو بە پێغەمبەرﷺ

(ها)ی (بِهِ) دەگونجێت بۆقورئان یان بۆ پێغەمبەرﷺ بچێتەوە. وە نەبکڕنو نەبگۆڕنەوە بە نیشانەکانی من بەسودێکی کەم، مەبەست ئەوە نیە کە ئەگەر نرخەکەی زۆر بو دروستە لە ڕاستیدا ئەگەر هەمو دنیا بە یەك ئایەتی قورئان بکڕی زیانت لێ کەوتوە، چونکە لە لای خوای گەورەئەم دنیایە هەر هەموی بە ئەندازەی یەك زەڕە ئەرزشی نیە وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لَوْ كَانَتِ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ/رواه الترمذی وصححه الالبا / ئەگەر ئەم دنیایە لە لای ﷲ بە ئەندازەی پەڕی مێشوولەیەك کێشو ئەرزشی هەبوایە خودا یەك قومە ئاوی لەم جیهانەدا بەکافر نەدەدا} دەی ئیتر تەنها لە من بترسن وەلە کەسی تر نەترسن.

(٤٢)حەقو ناحەق تێکەڵ مەکەن و حەق بشارنەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئێوە دەزانن کە ئەم دینە حەقو ڕاستە. نەڵێن گاورو جوولەکە هەروەکو ئیسلامن، نەخێر وەکو یەك نین، ئەو دووانە ناحەقنو ئیسلام حەقە. بزانە هەمو پێغەمبەران هەر یەك لە زەمانی خۆیدا پەیمانیان لێ وەرگیراوە کە پێغەمبەرێك بەم ناوونیشانە دێت دەبێ باوەڕی پێ بهێننویارمەتی بدەن. کەوابو هەمویان زانیویانە کەپێغەمبەر دێتوچاکیشیان ناسیوە، ئەوەبو جووەکان دەیان وت: بە جەماعەتی مەدینە پێغەمبەرێك دێت ئێمە دوای دەکەوینو هەموتان دەکوژین، بەڵام کاتێ کەپێغەمبەری خوا ﷺ هاتو گەیشتە لایان دانیان پێدا نەنان، هەر لە بەر ئەوەی کە لە خۆیان نەبوو حەسوودییان بەوان دەبرد ئەگینا هەمویان دەیان ناسیو دەیانزانی کە ئەوە پێغەمبەری خوایە.

(٤٣)ئەو پێنج نوێژە جێ بە جێ بکەنو زەکات بدەن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەوا گەردن کەچن بۆ فەرمانی خواو نوێژدەکەن ئێوەش گەردن کەچو فەرمانبەرداری ﷲ بن.

﴿ رکوع﴾ چەمینەوەیە. لێرە ماناکەی گشتی ترە، بە مانای گەردن کەچیە بۆ ﷲ ئیتر هەمو شتەکانی تر دەگرێتەوە، وە ئەگەر بە مانای رکوعی ناو نوێژبێت ئەمە پێێ دەوترێت ﴿ تخصیص﴾ لە پاش ﴿ تعمیم﴾ چونکە لە پێشەوە فەرمویەتی: نوێژ بکەن دەش گونجێ مەبەست نوێژی جەماعەت بێت واتە نوێژەکانتان بەجەماعەت بکەن.

(٤٤) ئایا ئێوە فەرمان دەکەن بە خەڵك بۆ چاکەکردن وئەنجامدانی شتی پەسەندو جوان بەڵام خۆتانتان لە بیر چووەتەوە، وە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێوە کتێب دەخوێننەوە کە تەوراتو ئینجیلە.ئایا عەقڵتان نیە، دەی بۆ بیر ناکەنەوە؟!

وەك لە فەرمودەدا هاتووە کە: {يُؤْتَى بِالرَّجُلِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَيُلْقَى فِي النَّارِ فَتَنْدَلِقُ أَقْتَابُ بَطْنِهِ فَيَدُورُ بِهَا كَمَا يَدُورُ الْحِمَارُ بِالرَّحَى فَيَجْتَمِعُ إِلَيْهِ أَهْلُ النَّارِ فَيَقُولُونَ يَا فُلَانُ مَا لَكَ أَلَمْ تَكُنْ تَأْمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَى عَنْ الْمُنْكَرِ فَيَقُولُ بَلَى قَدْ كُنْتُ آمُرُ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا آتِيهِ وَأَنْهَى عَنْ الْمُنْكَرِ وَآتِيهِ/ مسلم/ لەرۆژی قیامەتدا پیاوی زاناو دیاری وادەهێنرێت، جا فڕە دەدرێتە ناو ئاگرەوە ئەوسا ریخۆڵەکانی ناوسکی دێنە دەرەوە و لەناو ئاگری جەهەننەم دا دەیسوڕێنێتەوە هەروەك چۆن کەر بەرداش دەسوڕێنێتەوە ئەو کاتە خەڵکی دۆزەخی لەدەوری کۆدەبنەوە جا دەڵێن: ئەی فلانە کەس ئەوە بۆ وایت ئەی تۆنەبویت فەرمانت دەکرد بەچاکەو بەرگریت دەکرد لەخراپە؟! دەڵێ بەڵێ ڕاستە من دەم وت: چاکە بکەن بەڵام خۆم نەم دەکرد، وە دەم وت: خراپە مەکەن بەڵام خۆم دەمکرد}.

پێویستە ئەوەش بزانین کە ئەمانە خوێندەوار بوون، بەڵام بە زانینەکەی خۆیان کاریان نەکردوە. ﷲ دەفەرموێ: ﴿ بۆ دەیڵێیت ئەوەی کەخۆت نایکەیت؟﴾سف/٢.

بۆ خۆتت لە بیر چووەتەوە؟! پاش ئەوەی کە مرۆڤ ئایینەکەی خوای وەرگرت ئاشکرایە ئەرك دەکەوێتە سەرشانیو سەختیو گرفتاری ڕوی تێدەکات بۆیە باسی دەرمانی ئەم ناڕەحەتیو گرفتاریانەمان بۆدەکاتو دەفەرموێ:

(٤٥) بۆ ئاسانکردنی ناڕەحەتیو گرفتارییەکانتان داوای یارمەتی بکەن بە خۆگریو بەنوێژ، جا بێگومان کە ئەو ئیشە زۆر

گەورەیەوسەختە ئەنجامدانی مەگەر لەلای ئەو کەسانەی کە خۆیان بەزل نازانن‌و گوێڕایەڵ‌و گەردن کەچی پەروەردگارن.

ئارام گرتن‌و خۆگری سێ جۆرە :

یەکەم: ئارام گرتن لەسەر نەکردنی گوناح. دووهەم ـ ئارام گرتن لەسەر ئەنجامدانی عیبادەت. سێهەم ـ ئارام گرتن لەسەر تەنگو چەڵەمەو هەر کێشەیەك کە ڕوودەدات. ئەم سێ جۆر ئارام گرتنە هەیە، هەر کەس خۆی گرت لەسەر ئەم سیانە ئینجا بەرهەمێکی گەورەو خۆشی بێژماری دەست دەکەوێت وەك دەفەرموێ:﴿ ئارام گران هەر پاداشتی بێ ژماریان هەیە﴾زومەر/١٠. وتراوە " ئارام گرتن تاڵە بەڵام بەرەکەی شیرینە" لە هەمو خۆشتر ئەمەیە کە اللّٰه لەگەڵ صابیرو‌ئارامگران دایە. کەواتە دەرمانی یەکەم بۆ ئاسانکردنی گرفتارییەکانمان خۆگریە.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إنّ مِن وَرَائِكُم زَمانَ صَبْرٍ لِلْمُتَمَسِّكِ فِيهِ أَجْرُ خَمْسِينَ شَهِيداً مِنْكُم /الطبراني ، صحح الالبانی / بێگومان لە پاش ئێوە کاتی خۆگریەك دێت کە هەر کەسێك لەو کاتەدا خۆ بگرێت پاداشتی پەنجا شەهیدی ئێوەی هەیە}

وە هەروەها دەفەرموێ:

{وَمَنْ يَتَصَبَّرْ يُصَبِّرْهُ اللهُ وَمَا أُعْطِيَ أَحَدٌ عَطَاءً خَيْرًا وَأَوْسَعَ مِنَ الصَّبْرِ/متفق علیه/ ئەوەی کە خۆراگر بێت، اللّٰه سەبرو خوراگری بۆ ئاسان دەکاتو تەوفیقی دەدات، وە هیچ کەسێك بەخشینێکی چاکترو فرەوانتری لە خۆراگری پێنەدراوە}

وە دەرمانی دووهەمی سەختیەکان: بریتیە لە نوێژ کردن. کاتێ کە مرۆڤ توشی تەنگو چەڵەمە بو نوێژەکەی ڕێك‌و پێك بکات‌و بزانێ بۆچی دەیکات؟ وە بزانێ بەرامبەر بەکێ وەستاوەو بۆچی وەستاوە؟ گرفتاریەکەی لەلا ئاسان دەبێت‌و دڵی فەرەح دەبێت. لە ڕیوایەتدا هاتوە کەهەر کاتێ پێغەمبەر ﷺ دەکەوتە نارەحەتی‌و گرفتاریەوەو تەنگو چەڵەمەیەك یەخەی دەگرت دەی فەرمو: {يَا بِلالُ أَقِمْ الصلاةَ أَرِحْنَا بِهَا /ابوداود، صحح الالبانی / واتە ئەی بیلال هەڵسە قامەتی نوێژ بکە وبەو کەیف خۆشمان بکە}

بەردەوامبون لەسەر پێنج نوێژ هەمو ڕۆژێ تا مرۆڤ لە ژیاندایە شتێکی گەورەیەو بەرهەمێکی زۆر گەورەیشی هەیە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إن العَبْدَ إذا قَامَ إلى الصلاةِ المَكْتُوبَةِ أُتِيَ بِذُنُوبِهِ كُلِّهَا فَوُضِعَتْ عَلَى عَاتِقِهِ فَكُلَّمَا رَكَعَ أو سَجَدَ تَسَاقَطَتْ عَنْهُ / البیهقي، صحح الالبانی / بێگومان کاتێك کە بەندە هەڵدەسێت بۆ نوێژێکی واجب هەمو گوناهەکانی دەهێنرێت، جا لەسەر هەردوو شانی دایدەنێن ئینجا هەر کات چوە کرنوش یان سوجدەی برد گوناهەکانی لێدەکەونە خوارەوە} چونکە نوێژ هێڵێکی ڕاستەو خۆیە لەگەڵ خواداو ئەرکێکی زۆر قورسە مەگەر لەلای ئەو کەسانەی کە گەردن کەچن بۆ فەرمانی اللّٰه، ئەوان لایان ئاسانەو

بە ئەنجامدانی نارەحەت نین بەڵکو پییان خۆشە. کامانەن گەردن کەچان (الخاشعون)؟

(٤٦) ئەوکەسانەن کە یەقینیان هەیەو بێگومانن کە دەگەن بە پەروەردگاری خۆیان‌و دڵنیان کە هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوەو بەرهەمی کردارەکانی خۆیان وەردەگرن.

﴿ظَن﴾ لێرە بە مانای یەقینە.

(٤٧) دووبارە خوای گەورە بە نەوەکانی یەعقوب دەفەرموێ: ئەی کوڕانی یەعقوب، بیر کەنەوە لەو نیعمەتانەی من کە ڕژاندم بە سەرتاندا، بێگومان من ئێوەم بەرز کردەوەو ڕێزی ئێوەم دا بە سەر خەڵکی سەردەمی خۆتان داو لەخۆتان ئەو هەمو پێغەمبەرانەم بۆ ڕەوانە کردن.

(٤٨) جا بترسن لە ڕۆژێك کە هیچ نەفسێك سوود نادات بە نەفسێکی ترو، هیچ تکا کارییەك وەرناگرێت‌و لە هیچ نەفسێکیش بەرتیلێك وەرناگیرێت‌و ئەوان یارمەتی نادرێن.

مەبەست لە شەفاعەت لێرە شەفاعەت بۆ کافرانە، ئەگینا پێغەمبەرمانﷺ شافیعە بۆمان بە فەرمودەی دروست، بەڵام بەو مەرجەی دەبێ خۆشمان ئیشێکی وامان کردبێت کە شایستەی شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ بین، واتە: پەیڕەوی بەرنامەی پێغەمبەرمانﷺ کرد بێت‌و ڕێبازی ئەومان گرتبێت، بەڵام لە کەم‌و کوڕیەك کە هەمانە بە بێگومان پێغەمبەرﷺ شەفاعەتمان بۆ دەکات. ئەوانەی کە شەفاعەتیان بۆ ناکرێت کەسانێکن کە باوەڕیان بە قیامەت وبە زیندوبونەوە نیەو هیچی بۆ ئەو ڕۆژە نەکردوە، بێگومان ئەو ڕۆژە هیچ کەس شەفاعەتی بۆ ناکات.

ئینجا ئەو کەسەی باوك‌و باپیری پیاوی چاك بوون، بەڵام خۆی گوێ ناداتە ئایین‌و پێی وایە باوك وباپیری ڕزگاری دەکەن یان ئەو کەسانەی کە تاوان دەکەن‌و چاوەڕێی شەفاعەتن بەڕاستی هەڵەن چونکە دەبێ مرۆڤ کرداری چاك بکات‌و ترسی دوا ڕۆژی هەبێت ئینجا چاوەڕێی شەفاعەت‌و ڕەحمی اللّٰه بکات. نەك هەر خەریکی تاوان کردن بێت بە تەمای شەفاعەت چونکە تاوان کردن وەك ئەوە وایە بڵێ من زەهر دەخۆم چونکە دکتۆر هەیە؟! ئینجا کێ دەڵێ ئەو کابرا زەهر خۆرە دەگاتە دکتۆر وە یان ئەو دەرمانە سوودی دەبێ بۆی؟

ئینجا خوای گەورە چەند نیعمەتێکی خۆی‌و چەند ناڵەبارییەکی پێشینەکانی ئەوان دەخاتە ڕوو بۆ ئەوەی کە بیر بکەنەوە جادەفەرموێ:

(٤٩) جا بیر کەنەوە لەو کاتەی کە ئێوەمان ڕزگار کرد لە ئالی فیرعەون کەئەوان جۆرەها سزایان بە ئێوە دەچەشت‌و

وَإِذۡ نَجَّيۡنَٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٤٩﴾ وَإِذۡ فَرَقۡنَا بِكُمُ ٱلۡبَحۡرَ فَأَنجَيۡنَٰكُمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿٥٠﴾ وَإِذۡ وَٰعَدۡنَا مُوسَىٰٓ أَرۡبَعِينَ لَيۡلَةٗ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ عَفَوۡنَا عَنكُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡفُرۡقَانَ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿٥٣﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِنَّكُمۡ ظَلَمۡتُمۡ أَنفُسَكُم بِٱتِّخَاذِكُمُ ٱلۡعِجۡلَ فَتُوبُوٓاْ إِلَىٰ بَارِئِكُمۡ فَٱقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ عِندَ بَارِئِكُمۡ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٤﴾ وَإِذۡ قُلۡتُمۡ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤۡمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهۡرَةٗ فَأَخَذَتۡكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَٰكُم مِّنۢ بَعۡدِ مَوۡتِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٥٦﴾ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡغَمَامَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٥٧﴾

کوڕەکانتانی سەر دەبڕین وژنەکانتانی دەهێلانەوە، تاکو بیانکەن بە کەنیزەو خزمەتکار بە راستی ئا لەوەدا بەلایەکی زۆر گەورەی خوا بو بە سەر ئێوەوە بە هۆی ئەو خراپە کاریانەی کە دەیکەن.

(٥٠) وە بیری لەو کاتە بکەنەوە کە دەریامان بۆ لەت کردن، جا ئێوەمان رزگار کردو ئالی فیرعەونمان خنکاند لە کاتێکدا کە ئێوە سەیرتان دەکردن. ئەگەرچی ئەم روداوە ئەوان نەیان بینی بو، بەلام خوای گەورە هەواڵەکە دێنێتەوە بەر چاویان چونکە باب‌و باپیری ئەوان بون‌و ئەوانیش لە تەوراتدا ئەم باسانەیان زۆر خوێندۆتەوەو باسەکەیان زۆر باش زانیوە هەروەك ئەوەیەکە لە بەر چاویان بێت چونکە ئەگەر وانە بوایە بە دڵنیاییەوە رەخنەیان دەگرت.

(٥١) ئەی محمدﷺ بۆیان باس ئەو کاتەی کە بەڵێنمان دا بە موسا کە بێت بۆ لامان‌و چل شەو بمێنێتەوە لە پاش ئەوەی کە موسا چوو، ئێوە گوێرەکەتان پەرست، وە ئێوە ستەمکارن.

کەسێکیان لە ناو دا بوو بە ناوی سامری، ئەو هات لەو خشڵ‌و ئاڵتون‌و جەواهیراتەی کە ئەوان بە غەنیمەت دەستیان کەوت بو ولە چاڵێکدا تواند بوویانەوە تا بزانن چ بڕیارێکی لەسەر دەدرێت، ئەوپەیکەری گوێرەیەکی لێ دروستکرد لە کاتێکدا کە جبرائیلی دی بو لە ژێر پێی (بۆراق) دا کە جبرائیل سواری ببو کەمێك خاکی هێناو کردیە دەمی ئەو پەیکەرەو دەنگێکی لێوە هات هەر کە ئەم دەنگە هات، ئینجا سامری بانگی کردن‌و وتی: ئەمە خوای ئێوەو موسایەو موسا لە بیری چووە، ئینجا هاروون زۆری ئامۆژگاری کردن کە ئەمە هیچی لە تواناداا نیەو ناتوانێ وەڵامتان بداتەوە بەڵکوئەمەتاقی کردنەوەیەکەبۆتان‌و شتی وا مەکەن، وتیان نەخێر ئێمە لەسەر ئەمە لاناچین تا موسا نەیەتەوە.

(٥٢) لە پاشان ئێمە لە پاش ئەو تاوانەش لێیان خۆش بوین بۆ ئەوەی کە سوپاسی ﷲ بکەن‌و دەست لە دژایەتی پێغەمبەران (علیهم السلام) هەڵگرن.

(٥٣) باس بکە ئەی محمد ﷺ کاتێ کە ئێمە کتێب‌و فورقانمان(ئیجیل‌و نۆبەڵگە گرنگەکان) دا بە موسا بۆ ئەوەی کەرێگەی هیدایەت بگرن تاکو بەختەوەر بن. ئێمە ئەو هەمو نیعمەتانەمان بە سەر دا رژاندن، بەلام بە داخەوە جولەکە لەم هەمو نیعمەتانەی ﷲ خۆیان کوێر کرد.

(٥٤) باس بکە بۆیان ئەی محمدﷺ کاتێ کەموسا گەڕایەوەو پێی وتن بە راستی ئێوە زوڵمتان لە خۆتان کردوە بەوەی کەوا گوێرەکەتان(گۆلك) کردوە بە خوای خۆتان، سا بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگارتان جا خۆتان بکوژن یان یەکتر بکوژن.

دەگونجێ لەو سەردەمەدا مەرجی تەوبە ئەوە بووبێ هەتا خۆیان نەکوژتایە ﷲ تەوبەی لێ قەبووڵ نەکردنایە، بەلام ﷲ بە لوتفی خۆی ئەم بارە سەختەی لەسەر ئەم ئوممەتە هەڵگرتوە. یان با چاکەکانتان خراپەکانتان بکوژن، ئینجا ﷲ تەوبەتان لێ قەبوڵ دەکات، ئا ئەمە چاکە بۆتان لە لایەن ئەو پەروەردگارەی کە ئێوەی دروستکردوە جا ئەگەر واتان کرد ئەوسا خوای گەورە تەوبەتان لێ قەبوڵ دەکات بە راستی ﷲ تەوبە وەرگرەو وزۆر بەسۆزە بۆ بەندەکانی خۆی.

ئەمە هەموی سۆزو نیعمەتی ﷲ یە کەپیشانیان دەدات بۆ ئەوەی کە جووەکان بیر بکەنەوەو واز لەو سەرکێشیە بێنن‌و دژایەتی پێغەمبەرﷺ نەکەن، بەڵکو پەیڕەوی پێغەمبەرﷺ بکەون‌و رێگای راست بگرن.

(**بارئ**)واتە ئەوەی کە لە نەبوون شت بەدیدەهێنێت. ئەم ناوەی پەروەردگار دووجار لەم ئایەتەداو جارێکیش لە ئایەتی بیست‌و چواری سورەتی حەشردا هاتوە.

(٥٥)بیر کەنەوە لەو کاتەی کە وتتان بە موسا باوەڕ بە تۆ ناهێنین هەتا ﷲ بە چاوی خۆمان نەبینین ئەوسا گرمەو دەنگێك هات‌و ئێوەی گرت‌و مردن لە کاتێکدا کە خۆتان تەماشاتان دەکرد.

وَإِذْ قُلْنَا ادْخُلُوا هَٰذِهِ الْقَرْيَةَ فَكُلُوا مِنْهَا حَيْثُ شِئْتُمْ رَغَدًا وَادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَّغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ ۚ وَسَنَزِيدُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ فَبَدَّلَ الَّذِينَ ظَلَمُوا قَوْلًا غَيْرَ الَّذِي قِيلَ لَهُمْ فَأَنزَلْنَا عَلَى الَّذِينَ ظَلَمُوا رِجْزًا مِّنَ السَّمَاءِ بِمَا كَانُوا يَفْسُقُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ وَإِذِ اسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِ فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ ۖ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ۖ قَدْ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٍ مَّشْرَبَهُمْ ۖ كُلُوا وَاشْرَبُوا مِن رِّزْقِ اللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٦٠﴾ وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَىٰ لَن نَّصْبِرَ عَلَىٰ طَعَامٍ وَاحِدٍ فَادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُخْرِجْ لَنَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ مِن بَقْلِهَا وَقِثَّائِهَا وَفُومِهَا وَعَدَسِهَا وَبَصَلِهَا ۖ قَالَ أَتَسْتَبْدِلُونَ الَّذِي هُوَ أَدْنَىٰ بِالَّذِي هُوَ خَيْرٌ ۚ اهْبِطُوا مِصْرًا فَإِنَّ لَكُم مَّا سَأَلْتُمْ ۗ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ الذِّلَّةُ وَالْمَسْكَنَةُ وَبَاءُوا بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ ۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَانُوا يَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَيَقْتُلُونَ النَّبِيِّينَ بِغَيْرِ الْحَقِّ ۗ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ ﴿٦١﴾

(٥٦) له پاش ئەو مردنە ئێوەمان زیندو كردەوە بەڵكو ئێوەش سوپاس‌و شوكری ﷲ بكەن لەسەر ئەو هەمو نیعمەتانەی كە ئێمە ڕژاندمان بە سەرتاندا. وەبزانن كە ئێوە ئەوەندە لاوازن كە بەرامبەر بە گرمەیەكی ئاسمان خۆ ناگرن‌و دەمرن باشە چۆن دەتانەوێت پەروەردگاری ئاسمان‌و زەوی ببینن؟

(٥٧) خۆ بە هەوریش سێبەرمان بۆ كردن‌و بارانمان بە سەرتاندا گەزۆ‌و باڵندەی شیلاقە - جاوتمان - لەو پاكانەی كە پێمان داون بخۆن، خۆ ئەوان ستەمیان لەئێمە نەكرد بەڵام ستەمیان لە نەفسی خۆیان كردوە.

(٥٨) سا بیر بكەنەوە لەو كاتەی كە وتمان بچنە ناو ئەو شارەوە كە فەلەستینە، ئەوسا لە هەر جێگایەكی ئەو شارە كە مەیلتان لێ یە بە فرەوانی‌و بە لێشاوی بخۆن‌و لەو دەرگاوە بە شێوەیەكی گەردن كەچ بۆ ﷲ بچنە ناوەوەو بڵێن: خوایە ئەو تاوانەی كە كردومانە لە سەرمان لابە، ئێمەش لە گوناهەكانتان خۆش دەبین‌و ئینجا پیاوی چاكتان لێ زۆر دەكەین، وە بە چاكە كاران شتی زیاتر دەدەین. بە شاری گەورە دەوترێت (قريه) وەك بە مەكە دەفەرموێ: **(ام القرى)**.

(٥٩) بەڵام لەباتی ئەوەی ئەوان ئەو فەرمانە جێ بە جێ بكەن بە پێچەوانەوە ئەو كەسانەی كە زاڵم بون ئەو قسەیەی كە ئێمە پێمان وتن گۆڕییان.

دەڵێن لە باتی ئەوەی سوجدە بەرن، بە پشتا دەچوونە ناوەوەو لە باتی ئەوەی كە داوا بكەن كە ﷲ لە گوناهانیان خۆش بێت، داوای خۆراكیان دەكرد. واتە ئەمانە كارەكانیان هەمو بە پێچەوانەوە ئەنجام دەدا. بۆیە دوچاری سزا بوون وەك دەفەرموێ: ئەوسا ئێمەش بۆ ئەوانەی كە زوڵمیان كردوە عەزابمان لە ئاسمانەوە بۆ ناردن بە هۆی ئەو فیسق‌و دەرچونیانەوە لە یاسای ﷲ.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**قِيلَ لِبَنِي إِسْرَائِيلَ ادْخُلُوا الْبَابَ سُجَّدًا وَقُولُوا حِطَّةٌ نَغْفِرْ لَكُمْ خَطَايَاكُمْ فَبَدلُوا فَدَخَلُوا يَزْحَفُونَ عَلَى أَسْتَاهِهِمْ وَقَالُوا حَبَّةٌ فِي شَعَرَةٍ** (متفق عليه)} بێژرابە نەوەی یەعقوب لەودەرگاوە كە چونە ژورەوە سوجدە ببەن‌و بڵێن: خوایە ئەو تاوانەی كە كردومانە لە سەرمان لابە ئێمەش لە گوناهەكانتان خۆش دەبین، كەچی گۆڕییان، بەسكە خشەو بە پشتا چونە ناویەوەو وتیان:دانەیەك لەجۆ}

(٦٠) جا بیر كەنەوە لەو كاتەی كە موسا داوای ئاوی كرد بۆ قەومەكەی، جا پێمان وت: ئەی موسا عاساكەت بدە لەو بەردە موسایش عاساكەی دا لە بەردەكە كتوپڕ لەو بەردە دوانزە سەرچاوەی ئاو هەڵقوڵان‌و هاتنە دەرەوە، ئەوانیش دوانزە بەرەباب بوون، جا هەر بەرەبابەو كانی خۆی پێدرا كە هەمویان دەیانزانی ئاو لە كامیان بخۆن، جا پێیان وترا بخۆن‌و بخۆنەوە لە رزقەكەی خواو لەسەر زەویدا فەساد بڵاو نەكەنەوە، خوای گەورە ئەو هەمو نیعمەتانەی بۆ ڕژاندن دەی ئێوەش سوپاسی ﷲ بكەن، هیوادارم خوای گەورە عەقڵ بە ئێمەش بداتو بزانین كە ﷲ خاوەنی ئەو هەمو دەسەڵاتەیە كە لە ناو بەردێكی رەقدا دوانزە سەرچاوەی ئاو بە سافی دەربێنێ.

ئاشكرایە كە ئەمانە باس كراون لە تەورات داو جووەكانی ئەوسەردەمە زانیویانە ئەگینا دژایەتیان دەكردو پێغەمبەریانﷺ بە درۆ دەخستەوە، بەڵام كە نەیانتوانیوە بە درۆی بخەنەوە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر پێغەمبەرێتی خۆشەویستمان محمد ﷺ چونكە مرۆڤێكی نەخوێندەواری وەك پێغەمبەر ﷺكەنەیتوانیوە بنوسێ‌و بخوێنێتەوە ئەگەر لە خواوە نیە، چۆن ئەو هەمو ڕاستیانە دەزانێت.

(٦١) جا بیر بكەنەوە لەو كاتەی كە وتتان: ئەی موسا ناتوانین ئارام بگرین لەسەر یەك خۆراك‌و هەمیشە هەر یەك جۆر خۆراك بخۆین، جا ئەی موسا تۆ داوا بكە لە خواكەت كەپێمان بدات ئەوەی كە زەوی سەوزی دەكات لە دانەوێڵەی‌و لە ترۆزییەكەی‌و لە سیرەكەی و لە نیسكەكەی‌و لە پیازەكەی.

لە باتی ئەو هەمو نیعمەتە گەورەیەی كە خوا پێی دابون لەو نیعمەتە شیرینەو لەو گۆشتە ناسكەو لەو سێبەرە جوانە، كەچی

هێشتا ئەوەندە لاسار بون داوای ئەو شتانەیان دەکرد. موسایش وتی: ئایا دەیگۆڕنەوە ئەو شتەی کە زۆر بێ قیمەتو سادەیە بەو شتەی کە زۆر چاکە. واتە ئایا سیرو پیازو نیسکتان پێ گرنگترەو باشترە تا ئەو هەمو نیعمەتە پیرۆزو بە نرخانە کە خوا پێی داون؟ دەی، ئەگەر وایە دەی دابەزن بۆ میسر یان بۆ هەر شارێك دەرۆن، جا ئەوەی کە داوای دەکەن لەوێ هەیە. لێرەدا شتێك هەیە پێویستە ئاماژەی پێ بکرێت، دابەزینی ئەوان بۆ شار لە لایەن موساوە بڕیارێکی نابەدڵییە چونکە ئەگەر پێی خۆش بوایە کە دابەزنە ناو شار هەر لە سەرەتاوە دەیهێنان بۆ شارەوەو لەوێ دایدەنان، چونکە ئەم پێغەمبەرە دەزانێت کە ژیانی شار وایە مرۆڤ کە لە شار بوو خەرجی زیاتری پێویستەو زیاتر دەرامەتی دەوێت تا خەرجی رۆژانەی بکات، بەڵام لە شوێنەکانی دوور بە شێوەیەکی سادە مرۆڤ دەتوانێ خۆی بژیێنێ وە زۆر شتی بە خۆڕایی دەست دەکەوێت وەکو ئاوو ئاگرو زۆر شتی تر، بەڵام کاتێ کە مرۆڤ هاتە شار پێویستی بە دەرامەتی زۆر هەیە کە ئەویش بە بێ رەنج نابێت، واتە: ئەگەر ئەم کۆمەڵە هاتن بۆ شار بە ناچاری سەر گەرمی ئیشو کار دەبنو ئەرکەکانی خوا پەرستیو جیهاد لە بیر دەچێتەوە، بەڵام ئەوان داوایان کردو هەر سوور بوون لە سەریو پێیان درا، جا بەڵا روی تێکردن وەك دەفەرموێ: ئینجا سەرشۆڕیو فەقیری روی تێ کردنو باڵی رەشی خۆی کێشا بە سەریان دا چونکە وەکو وتمان کاتێ کە دابەزینە شارەوە پێویستیان بە پارەو دەرامەت بوو ئەو کاتە لە یەك پەرتو بڵاو بوونو هێزو قوەتیان لاواز بو، جا ئیتر هەر کەسەو سەرگەرمی ئیشی خۆیەتیو ژیانی خۆی دابین دەکات ئەو کاتە ئەو زاڵمانەی کە دژی ئەوانن زاڵ دەبن بە سەریاندا.

وەئەوە سونەتێکە بۆ هەمو کۆمەڵێك لەسەر ئەم جیهانەدا کاتێ کە رووکەنە دنیا پەرستی دوچاری سەرشۆڕیو بێ نرخی دەبنو قورئان کە ئەم چیرۆکانەمان بۆ دەگێڕێتەوە بۆ ئەوە نیە کە تەنها بی خوێنینو بخەوین، بەڵکو بۆ ئەوەیە سوودی لێ وەربگرین وە ببێت بە پەند تا بزانین لە چی دا قازانج دەکەینو لە کامیان زیان دەکەین، بەڵێ مێژوو دووبارە دەبێتەوە، بەڵام شێوازی بەڵاو کارەساتەکان جیاوازن، وە هەندێ جاریش دەقا و دەق دەردەچێت، بۆیە خوای گەورە لە پایانی چیرۆکەکانەوە زۆر جار وشەیەکی وای هێناوە کە دەگونجێت ئەوەش بۆ تۆ هەبێت وەك﴿بێگومان بۆخاوەن عەقڵان ئا لەوەدا پەند هەیە ، بەڵکو فام بگرن بۆ گەلێك کە دەیانەوێ بزانو ...﴾ وە دەفەرموێ:﴿جا ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ئەو خراپانەی کە لێمان قەدەغە کردوون ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ لێدانو سزاتان﴾ئیسراو/٨. مانای وایە مێژوو دووبارە دەبێتەوە. ئەوەتە جوەکان سەرپێچی فەرمانی خواو

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ وَٱذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّيْتُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۖ فَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَكُنتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلَّذِينَ ٱعْتَدَوْاْ مِنكُمْ فِى ٱلسَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَٰهَا نَكَٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تَذْبَحُواْ بَقَرَةً ۖ قَالُوٓاْ أَتَتَّخِذُنَا هُزُوًا ۖ قَالَ أَعُوذُ بِٱللَّهِ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِىَ ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا فَارِضٌ وَلَا بِكْرٌ عَوَانٌۢ بَيْنَ ذَٰلِكَ ۖ فَٱفْعَلُواْ مَا تُؤْمَرُونَ ﴿٦٨﴾ قَالُواْ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا لَوْنُهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ صَفْرَآءُ فَاقِعٌ لَّوْنُهَا تَسُرُّ ٱلنَّٰظِرِينَ ﴿٦٩﴾

پێغەمبەرەکەی خۆیانﷺ کرد ئەوەتا خوا دەفەرموێ: ئیتر سەرشۆڕیو هەژاری روی تێ کردن. هەندێك وتویانە ئەم زەلیلیە مەبەستی سەرانە لێ سەندیانە، بەڵام پێم وایە ئەم مانایە لە وشەکەدا هەیە، چونکە زەلیلیو سەرشۆڕی روی کردە هەر گەلێك ئیتر ئەوەی کە زاڵە بە سەریاندا هەرچی ویست لەگەڵیاندا دەکات، سەرانە بێت، سزا بێت.....هتد.

ئیتر ئەوانە وەبەر رقو قینی خوا کەوتن چونکە خۆیان بە پیریەوە چوون، کە ئەوان بێ باوەڕ بون بە ئایەتەکانی خواو هەر بە ناحەقی چەندین پێغەمبەریان کوشت، هەتا دەڵێن لە رۆژێکا سی پێغەمبەریان شەهید کردوە چونکە لە سنور دەرچونو دژایەتی خواو پێغەمبەریان کرد. ئینجا چادری غەزەب بە سەر ئەواندا هەڵدراو ئیتر ئەوان تا نەگەڕێنەوە بۆ سەر رێبازی راستەقینە هەروا دەبن. وشەی **(بَاؤُ)** بە روتی ناوترێت واتە یان لەگەڵ خێردا یان لەگەڵ شەڕدا دەوترێ. وەکو لە سورەتی ئالی عیمران دا دەفەرموێ: ئەمانە هەمیشە ئاوا لە زەلیلی دان مەگەر دەست بگرن بە ئاینەکەی خواوەو ببن بە موسڵمان یان ئەوەتا هێزێکی گەورەی مرۆڤ لە پشتیان بێت. وەك ئەمرۆ کە جیهانی کوفر بەرگری لە یەهودیەت دەکاتو لە ژێر سایەی ئەواندا دەژی، ئەگینا ناژین.

﴿٦٢﴾ بەبێگومان ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بە خواو بەپێغەمبەری خواو دوای محمدﷺ کەوتوونو ئەوانەی کە

یەهودی بونو شوێنکەوتوی ئاینی موسا بونو ئەوانەی کە گەردن کەچ بون بۆ ئاینی عیساو پەیڕەویان لە ئینجیل کردووەو ئەوانەی کە لایان داوە لە دینە گۆڕاوەکانی سەردەمی خۆیانو رویان کردوەتە ڕێگای راستەقینە لە هەمو زەمانێکدا ئەو کەسەی لەوانە بەراستی باوەڕی بوو بێت بە خواو بە رۆژی دوایو کرداری چاکی کرد بێت، ئەوسا بۆ ئەوانە لە لای خوای خۆیان پاداشیان هەیەو هیچ ترسیان بۆ نیەو ئەوانە لە رۆژی قیامەتدا خەم ناخۆن.

دەگونجێ وشەی (یهود) لە یەکێك لەم مانایانەی خوارەوە وەرگیرا بێت، یەکەم یەهود لە (تهود) وەرگیرا بێت بە مانای دۆستایەتی یان یهود بە مانای (تهود) جموجۆل یان لە (یهودا) وەرگیرابێت کە گەورەترین کوڕی یەعقوبە یان وشەی یەهود بە مانای گەڕانەوە (الرجوع) بێت وەك دەفەرموێ:﴿ إِنَّا هُدْنَآ إِلَيْكَ /الأعراف:١٥٦ / ئێمە گەڕاینەوە بۆ لای تۆ. وە نەصاراش کۆمەڵێك لە جولەکەکان بون کە باوەڕیان بە پێغەمبەرایەتی عیسا کردو بانگەوازەکەیان قبوڵکردو عیسایش هاتنی دواین پێغەمبەری پێ موژدەدابون. وتراوە جوەکان بۆ سوك کردنی عیسا پێیان دەوت "هانصری" واتە سوكو بێ بایەخ، بەڵام عیسا وشوێن کەوتوانی بەم ناوە شانازیان دەکرد، وە وتراویشە چونکە لە شارۆچکەی "ناصرە" دا نیشتە جێبوون پێیان وتراوە "النصارى" ئێستاش بە مەسیحیەکان یان گاورەکان دەناسرێن. وشەی (صابئی) بە مانای لادانە، وتراوە ئەمانە کۆمەڵێك لە جولەکەن کە شوێنکەوتوی پێغەمبەر یەحیاو باوەڕیان بە هاتنی محمد بوە، جا جولەکەکانی تر زۆر رقیان لێیان بو لەبەر ئەوە بلاویان دەکردەوە کە ئەمانە ئەستێرە پەرستن تا خەڵك لە بنەمای بانگەوازەکەیان کە باوەڕبوون بە هاتنی محمدﷺ بێ ئاگا بێت دواتر رۆمان زۆری لێکردن تا ببن بە گاور بەڵام هەندێ وتویانە بە کۆمەڵێك دەوترێت کە ئەستێرەیان دەپەرست یان مەلائیکەیان دەپەرستو لە دینی یەهودیو نەصارا لایان دابو بەڵام ئەو (صابئی) ەی کە لەم ئایەتەدا هاتووە ئەو (صابئی) نیە بەڵکو بە مانای ئەو کەسەیە کە لە هەر زەمانێکدا لای دا لە ئینحرافو سەرگەردانی بۆ رێگای راستی اللهﷻ ، وەك (اصحاب الكهف) کە وازیان هێنا لە دینی باو باپیرانی خۆیان وەك ئەوەی کەقورەیش بە پێغەمبەری خوایان ﷺ دەوت ﴿ لقد صباء محمد﴾ محمد لای دا، کاتێ کە ئاینی ئیسلامی بلاو دەکردەوە. لێرەدا ئەم(صابئی)یە بەو مانایە دێت چونکە ناگونجێت بڵێین مەلائیکە پەرست یان ئەستێرە پەرست رزگارن.

جا مانای ئایەتەکە بەکورتی ئەوەیە کە ئەوەی کە خۆی بە موسڵمان یان بە یەهوودی یان بە نەصرانی یان بە صابئی داناوە مادام بەراستی باوەڕی بوو بێت بە خواو بە رۆژی دوایو کرداری چاکی کردبێت ئەوسا بۆ ئەوانە لە لای خوای خۆیان پاداشیان هەیەو هیچ ترسیان بۆ نیەو ئەوانە لە رۆژی قیامەتدا خەم ناخۆن. لێرەدا دەرکەوت کە خوا چەند بە سۆزو داد پەروەرە کە ناوو ناتۆرەو ناوبانگ دەور نابینێت، بەڵکو راستی دەوری هەیە واتە هەر کەسێك دوای راستیو حەقیقەت کەوت لە هەر زەمانێکدا ناوەکەی هەرچی بێت گرنگ نیە، گرنگ ئەوەیە کە دوای راستیو حەقیقەت کەوت بێت کە ئێستا سەردەمی ئاینو بەرنامەی محمدەﷺ ئەو کەسەی کە دوای قورئانو سوننەت بکەوێتو پەیڕەویان لێوە بکاتو نەیەوێت لابداتو لە بیرو باوەڕیدا چەوتی نەبێت، جا هەر ناوێکی هەبێت ئەو کەسە رزگارو خۆشبەختە چونکە ناوەرۆك دەور دەبینێت نەك رواڵەت.

بۆ زیاتر رون بونەوە جارێکی تر بەسەر مانای ئایەتەکەدا دێینەوە، لە دوای ئەوەی کە لە ئایەتەکانی پێشودا اللهﷻ بە خراپە باسی ئەهلی کتێب دەکات ئەو گومانە دروست دەبێت کە هەمو ئەهلی کتێب بەو شێوەیە خراپەکار ونالەبار بن، جا اللهﷻ لەم ئایەتەدا بنەمایەك نەك تەنها بۆ ئەهلی کتێب بەڵکو بۆ هەمو گەلان رون دەکاتەوە کە ئەوەش ئەوەیە هەرکام لەوانە ئیمانی هێناوەو کرداری چاکی کردوە ئەوە پاداشتیان لای اللهﷻ یەو رزگاری دوارۆژ چاوەڕوانیان دەکات، مەبەست لە ئیمانیش ئەوەیە کە پێغەمبەر لە وەلامی جبرەئیلدا پێناسەی کردوە کە: {أَنْ تُؤْمِنَ بِاللهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ /منفق عليه/ کە باوەڕت بە اللهﷻو بەفریشتەکانیو بە پەڕاوەکانیوبە پێغەمبەرانیو بەرۆژی دوایو بەقەزاو قەدەر بەسودو زیانیەوە هەبێت} ئیبنوعەباس دەڵێت: {مَابَعَثَ اللهُ نَبِيا إلا أَخَذَ عَلَيْهِ المِيثَاق لَئِنْ بُعِثَ مُحَمَّدٌ وَهُوَحَيٌّ لَيُؤْمِنَن بِهِ وَلَيَنْصُرَنَّهُ وَأَمَرَهُ أَن يَأْخُذَ عَلَى أُمَتِهِ المِيثَاقَ لَئِنْ بُعِثَ مُحَمَّدٌوَ هُم أَحيَاءٌ لَيُؤْمِنُن بِهِ وَلَيَنْصُرُنَّهُ /البُخَاري/ اللهﷻ هیچ پێغەمبەرێکی رەوانە نەکردوە مەگەر ئەوەی کە پەیمانی لێوەرگرتبێت کە ئەگەر محمدﷺ رەوانەکراو ئەویش ئەو کاتە زیندو بێ ئەوا ئیمانی پێبهێنێتو یارمەتی بدات، وە فەرمانیشی پێکردوە کە لە ئوممەتەکەیشی پەیمان وەرگرێت کە ئەگەر محمد رەوانە کراو ئەوانیش ئەوکاتە زیندو بون ئەوا ئیمانی پێبهێننو یارمەتی بدەن. کە ئەمە مانای ئایەتی هەشتاویەکی سورەتی ئالی عیمرانە کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ... ﴾

جا هەمو گەلانی پێشو کە باوەڕیان بە پێغەمبەرانی کاتی خۆیان بوە باوەڕیشیان بە هاتنی ئاخرین پێغەمبەری خوا هەبوە جا ئەمانە کە خاوەنی کرداری چاك بوونو بەگوێرەی ئاینی ئەو کاتەی خۆیان هەڵسوکەوتیان کردوە، پەروەردگار موژدەیان پێدەدات کە پاداشتیان دەداتەوە، بەڵام پاش هاتنی دوا پێغەمبەری خوا هەرکەس باوەڕی پێنەهێنێتو بە گوێرەی ئەو شەریعەتەی

کەئەو هێناویەتی رەفتار نەکات ئەوە بە باوەڕدار حیساب ناکرێتو جێگای ئاگری دۆزەخە، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَا يَسْمَعُ بِي أَحَدٌ مِنْ هَذِهِ الْأُمَّةِ يَهُودِيٌّ وَلَا نَصْرَانِيٌّ ثُمَّ يَمُوتُ وَلَمْ يُؤْمِنْ بِالَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ إِلَّا كَانَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ/مسلم وغ ه/ سوێند بەو کەسەی کە گیانی محمدی بەدەستە ناوی من بەگوێی هیچ کەس لەم ئوممەتە ناگات چ جولەکە بێت یان گاور، پاشان بمرێتو باوەڕی بەوەی کە من بۆی رەوانە کراوم نەهێنابێت ئەوە لەناو دۆزەخدایە} دووبارە خوای گەورە دەگەڕێتەوە سەر رووداوەکانی کوڕانی یەعقوبو چیڕۆکێکی تری کورتمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(٦٣)بیر بکەنەوە ئەی بەنی ئیسرائیلی کاتێ کە ئێمە لە ئێوە پەیمانێکی بتەومان وەرگرتو کێوی تورمان بە سەرتان دا بەرز کردەوەو پێمان وتن: بەهەمو هێزەوە وەری گرن ئەوەی کە پێمان داون و بیر بکەنەوە لەو شتەی کە تێیدایە، بەڵکو بە هۆی ئەوەوە خۆتان بپارێزن لە غەزەبی ﷻ.

ئەمە رووداوێکی زۆر گەورەیە چۆن کێوێکی وەکو تور خوا بەرزی کردەوە بە سەریانداو لەو کاتەدا بە دەنگێك بانگ کران ئەگەر بێتو ئەم کتێبە بە قوەت وبە هێزەوە وەر بگرن ئەم چیایە ناخەین بە سەرتانداو ئەوانیش پەیمانیان دا کە ئەم کتێبە بە قوەت وبە هێزی خۆمان وەری دەگرینو بیر دەکەینەوە لەو شتەی کە لەو کتێبە دا هاتوە کە تەورات بو بەڵام لە دوای دا لایان دا، پێویستە بیر لەم فەرمانە بکەینەوە کە دەفەرموێ: ﴿خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ : وەری گرن ئەوەی کە ئێمە پێمان داون بە قوەتو هێز ﴾ ئەمە تێمان دەگەیەنێ ئەوکەسەی کە ئاینی خوا وەردەگرێتو باوەڕی بە ئیسلام هەیەو خۆی لاواز دەکاتو دەڵێت: من نوێژ دەکەمو رۆژو دەگرمو هەر ئەوەندەشم پێ دەکرێت ئیتر لەوە زیاتر من چی بکەم؟ ئەم جۆرە قسانە سودیان نیە، چونکە دین پێویستی بە قوەتو هێز هەیە مرۆڤ کە وەری دەگرێت دەبێ جدی بێت چونکە ئەو خوا گەورەو خاوەن دەسەڵاتە یاری لەگەڵ خەڵکدا ناکات بەرنامەی بۆ ناردوەو یاسای بۆ داناوە کە بەهەمو هێزوتوانایی خۆیەوە وەری بگرێتو پەیڕەوی لێوە بکات.

(٦٤)لە پاشان ئێوە پاش ئەو پەیمانە پشتتان تێ کردو بڕیاری خۆتان نەبردە سەر، جا ئەگەر سۆزو رەحمی خوا نەبوایە بۆ ئێوە بەراستی ئێوە لە ریزی زیانکاران دەبون، بەڵام خوای گەورە تەوبەی لێ وەرگرتن.

(٦٥)بە راستی ئێوە زانیوتانە هەواڵی ئەو کەسانەی کە دەست درێژیان کرد لە رۆژی شەممەدا جا پێمان وتن: ببن بە مەیمونێکی بێزراوو ناشیرین.

جا دەگونجێ (والله اعلم) هەر بووبن بە مەیمون، ئەگەر چی هەندێ بە لایانەوە وایە کە لەخووڕەوشتدا وەکو مەیمونیان لێ هاتوە ، بەڵێ فڕوفێڵ لە ئاینی خوادا ئەوە تۆڵەیەتی بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ ئامۆژگاریمان دەکاتو دەفەرموێ: { لَا تَرْتَكِبُوا مَا ارْتَكَبَتِ الْيَهُودُ فَتَسْتَحِلُّوا مَحَارِمَ اللهِ تَعَالَى بِأَدْنَى الْحِيَلِ " /صَحَّحُ التِّرْمِذِيّ وحَسَنُه الألبا / نەکەن ئەو تاوانە بکەن کە جوو کردیان کەبە بچوکترین فێڵ حەرامەکانی خوایان حەڵاڵ دەکرد} لە فەرمودەدا هەیە کە لە ئاخیر زەمان دا شتی وا روودەدات لەناو ئەم ئوممەتی پێغەمبەرەداﷺ .

بە گوێرەی رەئی دووهەم مانای ئەم فەرمودەیە هاتوەتە دی چونکە زۆرێك لە خەڵك رەوشتی مەیمونو بەرازیان هەیە هەروەك مەیمون خەریکی لاسایی کردنەوەی خەڵکنو وەك بەرازیش بێ غیرەتو بێ عیزەتنو ژنو کچی خۆیان بەرەڵاکردوە. بۆ ئەوەی کە بزانی رۆژی شەممە چی بوە. تەماشا ئایەتی/١٦٣تا١٦٦/ئەعراف بکە.

(٦٦)خۆ ئەم روداوەشمان کرد بە پەند بۆ ئەو خەڵکەی سەردەمی خۆیو بۆ خەڵکی پاش ئەو روداوەش تا ئامۆژگاریەکی گرنگ بێت بۆ ئەوانەی کە لە خوا دەترسن.

(نَكَٰلٗا ) واتە: تۆڵە سەندنەوە لەسەر ئەو خراپەی کە کردیان بۆ ئەوەی ببێت بە پەند بۆ خەڵك.

ئینجا داستانێکی ترمان بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(٦٧)ئەی محمد ﷺ باس بکە بۆیان کاتێ کە موسا بە قەومەکەی وت: بێگومان کە خوا فەرمان بە سەر ئێوەدا دەدات کە مانگایەك سەر ببڕن، وتیان: ئایا گاڵتەمان پێ دەکەی؟ وتی: پەنا دەگرم بە خوا کە من لە نەفامان بم. نەی وت گاڵتە لەگەڵ ئێوەدا ناکەم، خۆ ئەوان نەیان وت: تۆ جاهیلو نەزانی ئەوان دەڵێن: گاڵتەمان پێ دەکەیت بەڵام وەڵامی موسا ئەوە دەگەیەنێ کە گاڵتە کردن ئیشی نەفامانە، لێرەدا ئەم تێبینیەم هەیە: ئیمڕۆ جیهانی فرتو فێڵو سیاسەت گەنجو لاوانێکی زۆری سەرگەرم کردوە بە دەیان جۆر گاڵتەو گەمەی بێ سوود، یان کەم سوودەوە بۆ ئەوانو پر خێرو خۆشی بۆ سیاسەتمەداران دیارە ئێمە وەکو مرۆڤدۆستی دڵمان بەو شتانە ناخۆشە چونکە لە پشتی پەردەی زۆربەی ئەم گاڵتەو گەمە وە فریو دان ودزینی ژیریی خەڵکی غەیرە سیاسی بە تایبەت گەنجو لاوان دەبینینو لە هەمو سەیرترو جێگای داخی

ئێمە ئەوەیە کە ئێمەی موسڵمان خاوەنی بەرنامەو یاسایەکین‌و بە پەیڕەوی کردنی ئەو یاسایە راستی موسڵمانیەتیمان دەر دەکەوێت کەچی هەروەکو بێ باوەڕان دەستیان داوەتە ئەم جۆرە گاڵتەو گەمانەو پارەی موسڵمانیان بۆ سەرف دەکرێت کە زۆربەی ئەم گاڵتەو گەمانە واریداتین‌و نامۆن لە ئیسلامدا لە بەر زۆر شت کە گرنگەکەیان ئەمانەن:

یەکەم ـ هەرچی لەسەر بردنەوەو دۆڕان بێت بێجگە لە ئەسپ سواری‌و تیرە ئەندازی حەرامەو بە قومار حیسابە لە ئیسلامدا.

دووەم ـ یاری چیانی گۆڵێن لە ئەژنۆیان بەرەو ژوور کە حەرامە دەرکەوێت‌و تەماشا کراوو تەماشاکەر هەردوو گوناهبارن.

سێهەم ـ ئێش‌و ئازاردانی موسڵمانان حەرامەو هەر ئەندامێکی بریندار ببێ یان بشکێ یان لە بەین بچێت تۆڵەی تایبەتی خۆی هەیە لە فیقهی ئیسلامدا بۆ نمونە: شکانی ددانێك یان پەنجەیەك پێنج حوشتر خوێنیەتی‌و دەرهێنانی چاوێك پەنجا حوشترە.

چوارەم ـ ئەم جۆرە یاریانە یاسای کفر دایهێناون‌و ئیسلام دەفەرموێ: {وَخَالِفُوهُم/ دژیان بجوڵێنەوە} وەدەفەرموێ: {مَن تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنهُم /ابوداود، الالبا :حسن صحيح/ هەرکەس لە هەڵس وکەوت‌و ئیشی دا خۆی بچوێنێ بە هەرگەلێکەوە لەوان حیساب دەکرێت}

پێنجەم ـ بە فیرۆدانی کاتێکی زۆر لە تەمەنی خەڵك بە تایبەت گەنج‌و لاوەکان‌و خاوەن تەلەفزیۆنان کەزۆربەی خەڵکی جیهان دەگرێتەوە، بەتایبەتی تر دورخستنەوەی گەنجانی موسڵمانان لەیادی خوا کەهۆیەکی سەرەکی قەدەغەبونی شەراب‌وقومارە.

شەشەم ـ خەریك بونە بە شتی پڕوپوچ‌و بێ مەبەستەوە، پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {مِنْ حُسْنِ إِسْلَامِ الْمَرْءِ تَرْكُهُ مَا لَا يَعْنِيهِ/متفق عليه/ لە جوانی موسڵمانیەتی مرۆڤە وازهێنان لەوەی کە مەبەستی نیە}

حەوتەم ـ ئیسلام سێ یاری گاڵتەو گەمەی بە لاوە پەسەندە : یاری ئەسپ سواری‌و تیرە ئەندازی‌و شۆخی‌و گاڵتەو گەمە کردن لەگەڵ هاوسەردا بێجگە لەم سێیانە نارەوایە ولایەنی کەم سەرقاڵ کردنی مرۆڤە لە یادی خوا کە بە راستی ئەمە مەبەستی سەرەکی دروستبونی ئەو یاری‌و گاڵتەو گەمانەیە.

هەشتەم ـ بەنج کردنی مێشکی خەڵکێکی زۆرە بە تایبەت گەنجان‌و دوور خستنەوەیان لە جیهانی سیاسەت کە بە راستی ئەمەش مەبەستێکی تری دروستبونی ئەو گەمانەیە.

نۆهەم ـ بەڵگەی کەم بیری ئەو خەڵك‌و گەنجانە یە کە خۆیان بەو شتانەوە سەر گەرم دەکەن پێتان وانەبێ کەسایەتی سیاسی بەوانەوە خۆیان خەریك بکەن‌و دەشگونجێت کاتی تەماشا کردنی تەلەفزیۆنیشیان هەر نەبێت. هیوادارم لاوان بەگشتی‌و بەتایبەتی لاوانی خواناس‌و ژیر خۆیان لەوجۆرە یاریانە بپارێزن، لەباتی ئەویاریانەدا سەرگەرمی ئەنجامدانی بەندایەتیەکان بن چونکە سەرەڕای ئەوپاداشتە گەورەیەی کەدەستیان دەکەوێت‌و لەدوارۆژدا لەدادگای خوای گەورەدا پێی سەربەرزن، دڵنیابن کە دەبێ بەمایەی تەندروستی چاك‌و شادمانی رۆح‌و دووربون لەنەخۆشیەکانی دڵ تەنگی‌و خەمۆکی کە ئەمڕۆ زۆربەی هەرەزۆری خەڵکی گرتوەتەوەو رۆژانە دەبنە هۆی روودانی دەیان رووداوی دڵ تەزێن.

دەیەم ـ هەندێك لەو یاریانە کاتێك داهێنرا کە ئەو خەڵکە دژی دوژمنەکانی خۆیان بێجگە لەو مرە مرو فیرە فیرە شتێکی تریان بە دەستەوە نەبو هەر کەدەستیان بە چەك دەگەیشت ئیتر وازیان لەو مرە مرە دەهێنا، ئەمڕۆ ئێمە لە بەر زۆری چەك گیرمان خواردوە، زیندو کردنەوەی ئەو جۆرە یاریانە بێجگە لە بەنج کردنی مێشك‌و دەماغی گەنجەکان چی سوودێکی گرنگی تری هەیە؟ گاڵتە نیە کە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ أَلَا إِنَّ الْقُوَّةَ الرَّمْيُ/ مسلم وغ ه / ئاگاداربن بێگومان هێز بریتیە لەتیرەندازی، ئاگاداربن بێگومان هێز بریتیە لە تیرەندازی، ئاگاداربن بێگومان هێز بریتیە لەتیرەندازی} هیوادارم موسڵمانان بێنەوە سەر خۆیان، بەراستی ئێمە ئەگەر نوێژەکانمان بە چاکی ئەنجام بدەین‌و رۆژووە پێویستەکان بگرین‌و بە شارەزا بوونی چەکەکانی سەردەمەوە بەکار هێنانیانەوە خۆمان خەریك بکەین بەسمانەو هەر ئەوەش ئیشی موسڵمانانەو هەر بۆ ئەوەش دروست بوین. کاتێك کە موسا وای پێ گوتن، دەرکەوت کە ئەوان قەومێکی لاسار بون‌و قسەکەیان لێ وەرنەگرت بەڵکو دەستیان کرد بە رەخنە گرتن.

(٦٨) وتیان: ئەی موسا داوا بکە لە پەروەردگارت با رۆشن بکاتەوە بۆمان‌و بزانین ئەوە چۆن مانگایەکە ؟ وتی: بێگومان کە اللّٰه دەفەرموێ: ئەو مانگایە نە پیرەو نە گەنجە، واتە مام ناوەندە سا بیکەن ئەوەی کە ئەمرتان پێ کراوە، مەوەستن‌و زیاتر لەسەری مەڕۆن.

(٦٩) وتیان: ئەی موسا داوا لە پەروەردگارت بکە بزانە ئەومانگایە رەنگی چۆنە؟ وتی: اللّٰه دەفەرموێ: ئەو مانگایە زەردە زەردێکی زۆر زەرد کە سەیرکەرانی کەیفخۆش دەکا. بەوەش وازیان نەهێنا و موسایش ئەمجارە نەی فەرمو دەی بیکەن دیارە لێیان نائومێد بوە کە جاری یەکەم موسا پێی وتن گوێیان نەدایە، ئەم جارە قسەکەی خۆی دووبارە نەکردەوەو ئەمەش رەوشتی مامۆستایە، کاتێك کە قسە لەگەڵ کەسێك دا دەکات پێی دەڵێ فلانە شت بکە لە سەرەتاوە کە بە باشی نایناسێ و هەڵس وکەوتی نازانێ ئەگەر

زانی نایکات دووبارەی ناکاتەوە بۆی، واتە: موسا عليه السلام جاری یەکەم فەرموی: ﴿ سا بیکەن ئەوەی کە فەرمانتان پێ کراوە ﴾ نەیان کرد، ئیتر ئەم جارە پاش رۆشن کردنەوە گوێی نەدانێ، دیسان ملە جەڕەیان کرد، بێگومان ئەو کاتە هەر مانگایەکیان سەر ببڕیایە دروستبو، بەڵام کە خۆیان ئەوەندە پرسیاریان کرد شتەکەیان لەسەر خۆیان گرانتر کرد.

(٧٠) وتیان: داو بکە لە پەروەردگارت با رۆشن کاتەوە بۆمان کە بزانین کامەیە ئەو مانگایە بەراستی ئەو مانگایە لێمان گۆڕاوەو بێگومان ئیتر لە هیدایەت دراوان دەبین **ان شاء ا** و ئەوەش کە فەرمانمان پێکراوە جێ بە جێی دەکەین.

(٧١) موسا عليه السلام فەرموی: الله دەفەرموێ: بێگومان ئەو مانگایە رام نیەو شت ناکێڵێو جووت ناکاتو ئاویش دەرناهێنێت، بەڵام ساغو سەلیمەو هیچ کەمو کوڕیەکی تێدا نیە وبێ نیشانەیە، وتیان: ئێستا حەقت هێناوەو باش لێی تێگەیشتین، ئەمەش نیشانەی زۆر لاساریانە، واتە: تاکو ئێستا حەقت نەوتووە، ئەوسا سەریان بڕیو نزیکبو نەیکەن. واتە کردیان.

وشەی (**كاد**) ئەگەر هاتو بە نەفی بو بە مانای شتەکە کراوە، وەئەگەر بە ئیسبات بو بە پێچەوانەوە، واتە: نەکراوە. جا دەڵێن ئەم سەربڕینی مانگایە لە بەر ئەم کوژراوەیە کە لەم ئایەتەی دواییەدا باسی دەکات، گوایە زەلامێك کوژراوەو بە ناحەق خراوەتە سەر کەسانێکی بێ تاوانو ئەوانیش لە لای موسا شکایەتیان کردو وتیان: سوێند بێت نە ئێمە کوشتومانەو نە ئاگامان لە بکوژیشی هەیە، ئەی موسا داوا بکە لە الله بۆمان رۆشن بکاتەوە، خواش فەرموی: با ئەو مانگایە سەر ببڕنو هەندێکی لەو کوژراوە بدەن زیندوو دەبێتەوە، وەك دەفەرموێ:

(٧٢) وە بیر بکەنەوە لەو کاتەی کە کەسێکتان کوشت، جا ئێوە ناکۆك بون لە بارەیەوەو هەر یەکەوپاکانەی بۆ خۆی دەکردو ئەی وت: ئەوی تر بوە، خۆ الله ئاشکراکەری ئەو شتەیە کە ئێوە دەیشارنەوە.

(٧٣) بۆیە وتمان: لەو کوژراوە بدەن بە هەندێك لەو مانگایە کە سەر بڕاوە، جادەڵێن لێی دراو کابرا زیندو بویەوەو ناوی بکوژی وت، بەم شێوەیە الله مردووەکان زیندو دەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە لە پاشە رۆژداو نیشانەکانی خۆیتان پێشان دەدات بەو هیوایەی کە ئێوەش عەقڵ بگرنو عاقڵانە بیر بکەنەوە. بەم شێوەیە تێی گەیاندین کە زیندوو کردنەوەی مردووەکان لای الله شتێکی گران نیە، هەندێك دەڵێن: دەستی کوژراوەکەیان هێناو لەگومان لێ

قَالُوا ادْعُ لَنَا رَبَّكَ يُبَيِّن لَّنَا مَا هِيَ إِنَّ الْبَقَرَ تَشَابَهَ عَلَيْنَا وَإِنَّا إِن شَاءَ اللَّهُ لَمُهْتَدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالَ إِنَّهُ يَقُولُ إِنَّهَا بَقَرَةٌ لَّا ذَلُولٌ تُثِيرُ الْأَرْضَ وَلَا تَسْقِي الْحَرْثَ مُسَلَّمَةٌ لَّا شِيَةَ فِيهَا ۚ قَالُوا الْآنَ جِئْتَ بِالْحَقِّ ۚ فَذَبَحُوهَا وَمَا كَادُوا يَفْعَلُونَ ﴿٧١﴾ وَإِذْ قَتَلْتُمْ نَفْسًا فَادَّارَأْتُمْ فِيهَا ۖ وَاللَّهُ مُخْرِجٌ مَّا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ ﴿٧٢﴾ فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا ۚ كَذَٰلِكَ يُحْيِي اللَّهُ الْمَوْتَىٰ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً ۚ وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ ۚ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ ۗ وَمَا اللَّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٧٤﴾ أَفَتَطْمَعُونَ أَن يُؤْمِنُوا لَكُمْ وَقَدْ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَسْمَعُونَ كَلَامَ اللَّهِ ثُمَّ يُحَرِّفُونَهُ مِن بَعْدِ مَا عَقَلُوهُ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَإِذَا لَقُوا الَّذِينَ آمَنُوا قَالُوا آمَنَّا وَإِذَا خَلَا بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ قَالُوا أَتُحَدِّثُونَهُم بِمَا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ لِيُحَاجُّوكُم بِهِ عِندَ رَبِّكُمْ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٧٦﴾

کراوەکانیان دا، جا ئەو لێدانە بو بە هۆی رەنگ تێکچونی بکوژو گرتیان تا دانی نا بەوەدا کە ئەو ئەو کەسەی کوشتوە .

لە یاسای ئیسلاما ئەگەر هات مردو زیندو بویەوە یان لەکاتی بێ هۆشیا بە هۆش هاتەوە دانی پێدانا لێی وەردەگرێت یان لە حاڵەتی سەرە مەرگا بو هۆشی بە خۆ بو، بەڵام نەیتوانی قسە بکات ئاماژەی لێ قەبوڵ دەکرێت، هەندێك دەڵێن ئەوە دەبێت بە گومانێکی بەهێز لەسەر کابراو حیساب نیە لە سەری، هەتا کابرا خۆی دانی پێدا نەنێ.

دەڵێن: جارێکیان جولەکەیەك ئافرەتێکی خستبوە نێوان دوو بەردو لێی دابو هەتا سەرو چاوی ورد کرد بو لە حاڵەتی گیان دەرچونا بو هێنایانە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ جا پێی وترا کێ وای لێ کردویت؟ چەند کەسێکیان ناو برد هیچ ئاماژەی نەکرد کە ناوی ئەو جولەکەیان هێنا بەسەری ئاماژەیەکی کرد، ئینجا جولەکەکەیان هێناو لێیان دا تا خۆیشی دانی پێدانا، ئینجا: {**فَأَمَرَ النبي صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ فَرُضَ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ** /متفق علیه/ پێغەمبەر ﷺ فەرمانی دا ـ چۆن ئەو ئافرەتەی خستبوە ناو ئەو دوو بەردەو سەری کوتا بویەوە، بڕۆن ئێوەش ئاوەهای لێ بکەن ـ جا سەری ئەو جولەکەش بە بەرد وای لێ کرا.

(٧٤) ئەی کوڕانی یەعقوب ئێوە لەم روداوە هیچ پەندێکتان وەرنەگرت بەڵکو پاش ئەوەش دڵتان رەق بو کە وەکو بەرد رەق بو یان زیاتر لە بەردیش رەقتر بو، چونکە بێگومان لەناو بەردان

أَوَلَا يَعْلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ ﴿٧٧﴾ وَمِنْهُمْ أُمِّيُّونَ لَا يَعْلَمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ إِلَّآ أَمَانِيَّ وَإِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٧٨﴾ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ يَكْتُبُونَ ٱلْكِتَـٰبَ بِأَيْدِيهِمْ ثُمَّ يَقُولُونَ هَـٰذَا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ لِيَشْتَرُوا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا كَتَبَتْ أَيْدِيهِمْ وَوَيْلٌ لَّهُم مِّمَّا يَكْسِبُونَ ﴿٧٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَةً ۚ قُلْ أَتَّخَذْتُمْ عِندَ ٱللَّهِ عَهْدًا فَلَن يُخْلِفَ ٱللَّهُ عَهْدَهُۥٓ ۖ أَمْ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨٠﴾ بَلَىٰ مَن كَسَبَ سَيِّئَةً وَأَحَـٰطَتْ بِهِۦ خَطِيٓـَٔتُهُۥ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَنَّةِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَـٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾

بەردی واهەیە چەندین روباری ئاوی لیٚ دەر دیٚتو بەردی وا هەیە کە شەق دەبیٚتو ئاوی لیٚ دەردیٚتو بەردی وایش هەیە کە لە ترسی ﷲ بەر دەبیٚتەوە بەلاٚم لە دلٚی ئیٚوە هیچ سەوز نابیٚت، بەلٚکو لە بەردیش رەقترە، ئینجا خوای گەورە هەرِەشەیان لیٚ دەکاتو دەفەرمویٚ:خوا بیٚ ئاگا نیە لەو شتانەی کە ئیٚوە دەیکەن.

﴿٧٥﴾ئینجا ﷲدلٚخۆشی موسلٚمانان دەکاتو دەفەرمویٚ: ئایا ئیٚوە ئومیٚدتان وایەو وای بۆ دەچن کەئەوانە باوەرِ بکەن بە ئیٚوەو گەردنکەچ ببن بۆ دینەکەتان؟ بەراستی کۆمەلٚیٚك لەوان قسەی خوایان دەبیست، پاشان دەیانگۆرِی پاش ئەوەی کە تیٚ دەگەیشتن لەحالٚیٚکدا کە ئەوان دەزانن راستو نارِاست کامەیە.

﴿٧٦﴾هەر کاتیٚك دەگەیشتن بە باوەرِداران دەیان وت: باوەرِمان هیٚناوەو کاتیٚ کە خۆیان بەتەنهایی دەمانەوەو کەس لە نیٚوانیاندا نەبو دەیان وت: نەچو بن بۆ ئەوان قسەتان کرد بیٚت، بۆ؟ چونکە ئەمانە ئیتر بەلٚگەیان دەبیٚ بۆ قیامەت لە لای خوای خۆیان، ئایا ئیٚوە ئیشی ئاوەها دەکەنو فام ناکەنەوە؟واتە ئیٚوە نەچوبن لە لای ئەو موسلٚمانانە باسی ئەو سیفەتانەی محمد تان کرد بیٚت کە لەکتیٚبی ئیٚمەدا باسکراونو بەلٚگەن لەسەر راستی محمد ﷺ قسەی ئاوەهاتان نەکرد بیٚت، تا لە قیامەتدا نەبیٚت بەبەلٚگەو حوجەت بۆیانو بلٚیٚن، بەلٚیٚ خوایە خۆیان دەیانزانیو خۆشیان شایەتن لەسەر ئەوەی کە دەیانزانی بەلاٚم بە گویٚیان نەکردیت پیٚیان وا بو کە خوای گەورە ئاگای لە شتە نهیٚنیەکانی ئەوان نیەو بەم شیٚوەیە وەسفیٚکی ناتەواو بۆ ﷲ دادەنیٚن کە نەبونی زانینی خوایە بە مەخفی کارییەکان واتە: دەیانزانی کە حیسابیٚك هەیەو باوەرِیان وابو کە ئەگەر بیٚتو بە دزیەوە قسە بکەنو دابنیشن ﷲپیٚیان نازانیٚ بەلاٚم باوەرِیان بەوە بو کە قیامەت هەیەو باوەرِیان بو کە ئەگەر بیٚتو ئەو حەقیقەتە لە زمانی ئەوانەوە وەربگیریٚت رۆژیٚك دیٚت کە بە دەستیەوە گیر بخۆن. ئینجا خوای گەورە دەفەرمویٚ:

﴿٧٧﴾ ئایا ئەوان هەروەها گیٚلوگەمژەنو نازانن ئەوەی کە ئەوان دەیشارنەوەو ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن، ﷲ پیٚی دەزانیٚت؟ بەلاٚم ئەوان هەمویان وەك یەك نین وەك دەفەرمویٚ:

﴿٧٨﴾ لە ناو ئەواندا هەبو کە نەخویٚندەواربو لەبارەی تەوراتەوە هیچی نەدەزانی مەگەر ئەوە نەبیٚت کە هیوایەکیان بە رەحمی خوا هەبو ئەوان بیٚجگە لەوەی کە گومان دەبەن شتیٚکی تر نازانن. ئەمانە هەمیشە هەر خەریکی درۆو دەلەسە بوونو هەرگیز راستیان پەسەند نەکردوە. بۆیە ﷲدەفەرمویٚ:

﴿٧٩﴾ سا هاوارو رِۆرِۆ بۆ ئەو کەسانە، یان (ویل) کەشویٚنیٚکە لە جەهەننەم ئەگەر هەموچیاکان بخریٚنە ناویەوە بەماوەیەکی زۆر کەم دەتویٚنەوە، بۆ ئەوکەسانەی کە بە دەستی خۆیان کتیٚب دەنوسنەوەو لە پاشان دەلٚیٚن: ئەمە لە لایەن خواوە هاتوە وەك ئەم تەوراتو ئینجیلەی کە ئەمرِۆ دەست کاریان کردوەو دەلٚیٚن: ئەمە لە لایەن خواوە هاتوە کە قورئان شایەتە کە دەستکاری کراونو گۆرِیویانن بۆ ئەوەی بەهرەیەکی کەمیان دەست کەویٚت.

وەك وتمان: ئەگەر هەمو دنیایشیان دەست بکەویٚت هەر بەهرەیەکی کەمە لە چاو قیامەتدا، بەلاٚم ئەم درۆو دەلەسانە دەکەن تا ئەو نانو کورسیەی کە ئەمرِۆ هەیانە لە دەستیان دەرنەچیٚت وای بۆ ئەوان لەو شتەی کە بە دەستی خۆیان نوسیویانەو واوەیلاو کۆسی گەورە بۆ ئەوان لەو ئیشەی کە دەیکەن. بەلٚیٚ بە راستی ئەوان هیچیان راست نیەو دەریش کەوت کە ئەو پەرِاوەی کەلە دەستیان دا هەیە نوسراوی دەستی خۆیانەو دەیدەنە پالٚ خوا. جاچۆن تەما دەکەن بەباوەرِهیٚنانی ئاوا گەلیٚك کە ئەوە سیفەتیانە؟

جا بۆیە ئیبنو عەباسیش دەلٚیٚت:{يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ كَيْفَ تَسْأَلُونَ أَهْلَ الْكِتَابِ وَكِتَابُكُمْ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَى نَبِيِّهِ ﷺ أَحْدَثُ الْأَخْبَارِ بِاللَّهِ تَقْرَءُونَهُ لَمْ يُشَبْ وَقَدْ حَدَّثَكُمْ اللَّهُ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ بَدَّلُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ وَغَيَّرُوا بِأَيْدِيهِمْ الْكِتَابَ فَقَالُوا هُوَ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ لِيَشْتَرُوا بِهِ ثَمَنًا قَلِيلًا أَفَلَا يَنْهَاكُمْ مَا جَاءَكُمْ مِنْ الْعِلْمِ عَنْ مُسَاءَلَتِهِمْ وَلَا وَاللَّهِ مَا رَأَيْنَا مِنْهُمْ رَجُلًا قَطُّ يَسْأَلُكُمْ عَنْ الَّذِي أُنْزِلَ عَلَيْكُمْ/البخاري/ ئەی موسلٚمانان چۆن ئیٚوە پرسیار لە ئەهلی کتیٚب دەکەن لەحالٚیٚکدا ئەو پەرِاوەی

ئێوە کەرەوانە کراوە بۆ پێغەمبەرەکەتان ﷺ تازەترین هەواڵانی تێدایە لەبارەی ﷲ ـە وە کە پیر نەبووەو ئێوە دەیخوێننەوە، بەراستی ﷲ پێی وتون کە بێگومان ئەهلی کتێب کتێبەکەی خوایان ئاڵو گۆڕ کردووەو بەدەستی خۆیانو گۆڕیویانە، ئینجا وتویانە ئەوە لەلایەن (ﷲ)ـە وەیە تا بەهرەیەکی کەمی پێ وەرگرن، دەی ئایا ئەوەی کە بۆتان هاتوە لە زانیاری ئێوەی بەرگری نەکردوە لەپرسیار کردن لەوان؟ بەخوا نەماندیوە هەرگیز پیاوێك لەوان پرسیار بکات لەئێوە لەبارەی ئەوەی کە رەوانە کراوەتە لاتان}

واتە بۆ ئەوەندە سادەو ساویلکەنو چۆن باوەڕ دەکەن بە قسەی ئەوان! جا ئەوە ئیبنوعەباسەو بەو خەڵکەی ئەو سەردەمەی وتوە ئەگەر ئەمڕۆ بوایە چی بەئێمە دەوت کە دوژمنانی خواو خۆمان دەکەین بەدۆستی خۆمانو بەئاشکراو بەنهێنی پێکەوە دادەنیشینو داو بۆ موسڵمانانو ئیسلام دەنێینەوە؟!

(٨٠) دەیان وت: ئاگر نامان سوتێنێ مەگەر چەند رۆژێکی دیاری کراو نەبێت. جا دەڵێن دنیا حەوت هەزار ساڵە ئێمە تەنها حەوت رۆژ دەسوتێین، واتە لە باتی هەر هەزار ساڵ یەك رۆژ دەسوتێین! ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئایا لای ﷲعەهدو پەیمانێکتان وەرگرتوە لەسەر ئەوەی کە بێجگە لە حەوت رۆژ نەبێت ناتان سوتێنین؟ ئەوسا ئیتر بۆ خۆتان دڵنیا بن چونکە ﷲ پێچەوانەی بڕیاری ناکات؟ یان ئایا ئێوە شتێك دەڵێن بەدەم خواوە کە خۆتان هیچی لێ نازانن‌و تەنها قسەیەکی سەرزارەکیەو هیچی تر؟.

(٨١) نەخێر وانیە کە ئێوە بیر دەکەنەوە کە بڵێن ئێمە، چونکە گەلی هەڵبژێردراوی ﷲ ین دوچاری سزا نابین هەر کەسێك بە هەر ناوێك بێت مادام کارو کۆششی خراپە کردن بو بێتو بە خراپە گەمارۆ دراوو داپۆشرا بێت ئەوسا ئەوانە ئیتر هاوڕێی ئاگرن و بۆ هەمیشەیش تێیدا دەمێننەوە.

(٨٢) ئەوسا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناو کرداری چاکیان کرد، ئەوانە هاوڕێی بەهەشتن‌و بۆ هەمیشە لە بەهەشتدا دەمێننەوە. لێرەش دەردەکەوێت کە باوەڕی بێ کردار هیچ سودی نیە هەروەك لەپێشدا باسمان کرد.

(٨٣) باسی ئەو کاتە بکە کە ئێمە پەیمانمان وەرگرت لە بەنی ئیسرائیل، چ پەیمانێك؟ ئەو پەیمانەی کە وتمان: جگە لە ﷲکەس نەپەرستن‌و پێمان وتن: لەگەڵ دایك‌و باوکتاندا چاکە بکەن‌و لەگەڵ خزمی نزیکتانداو لەگەڵ هەتیوان‌و هەژاراندا‌و لەگەڵ خەڵکدا قسەی جوان بکەن‌و نوێژ بکەن‌و زەکات بدەن. دیارە زەکات لەو سەردەمەشدا هەر پێویست بوە، چونکە نوێژ بۆ بتەو

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ (٨٤) ثُمَّ أَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تَقۡتُلُونَ أَنفُسَكُمۡ وَتُخۡرِجُونَ فَرِيقٗا مِّنكُم مِّن دِيَٰرِهِمۡ تَظَٰهَرُونَ عَلَيۡهِم بِٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَإِن يَأۡتُوكُمۡ أُسَٰرَىٰ تُفَٰدُوهُمۡ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيۡكُمۡ إِخۡرَاجُهُمۡۚ أَفَتُؤۡمِنُونَ بِبَعۡضِ ٱلۡكِتَٰبِ وَتَكۡفُرُونَ بِبَعۡضٖۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفۡعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ إِلَّا خِزۡيٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلۡعَذَابِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ (٨٥) أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا بِٱلۡأٓخِرَةِۖ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ (٨٦) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَقَفَّيۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ بِٱلرُّسُلِۖ وَءَاتَيۡنَا عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدۡنَٰهُ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِۗ أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسۡتَكۡبَرۡتُمۡ فَفَرِيقٗا كَذَّبۡتُمۡ وَفَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ (٨٧) وَقَالُواْ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَل لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَقَلِيلٗا مَّا يُؤۡمِنُونَ (٨٨)

کردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤو خالقی خۆیەتی لەبەر ئەوە لە هەموکاتدا پێویستە، وەزەکاتیش هەروایە چونکە ئەویش بۆ بتەو کردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤدایە. لێرەدا هەمو لایەنە پەیوەندی دارەکانی مرۆڤی بە شێوەیەکی کورت باسکردوە، پەیوەندیەکانی مرۆڤ لەگەڵ خواداو مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ دا بە هەمو چینەکانیەوە، باوك‌و دایك‌و چینی خزمی نزیك چینی هەتیو چینی هەژاران، جا ئیتر هەرچی کە ماوەتەوە ئەم وشە پیرۆزە دەیگرێتەوە کە دەفەرموێ: ﴿لەگەڵ خەڵکدا چاکە بکەن﴾ واتە: وتارو کردارتان جوان بێت سەبارەت بە خەڵك بەگشتی، لە پاش ئەوە جگە لە ژمارەیەکی کەمتان پشتتان هەڵچەرخاندو گوێتان بەو پەیمانەی کە ئێمە لێمان وەرگرتن نەدا.

(٨٤) بیر بکەنەوە لەو کاتەی کە پەیمانمان وەرگرت لە ئێوە کە خوێنی یەکتر نەرێژن‌و یەکتر دەرنەکەن لە ماڵ‌و زەوی‌و زاری خۆتان، لە پاشان دانتان بەم بڕیارەدانا لەحاڵێکدا کەئێوە خۆتان شایەتن لەسەر ئەم پەیمانە.

(٨٥) پاشان ئێوە ئەوە بوون کە برا کوژیتان دەست پێ کردو یەکترتان دەکوشت‌و یەکترتان لە خانوەکانی خۆتان دەردەکردو پشتی یەکترتان دەگرت بە دژی هەندێکتان بۆ گوناح‌و تاوان‌و دەست درێژی، کەچی ئەگەر ئەوان بگیرێن‌و دیل بکرێن ئێوە فیدیەیان دەدەن‌و رزگاریان دەکەن لەگەڵ ئەوەشدا کەحەرام بو لێتان دەرکردنیان، چۆن وا دەکەن؟ واتە: شەڕیان لەگەڵ یەکتر

وَلَمَّا جَآءَهُمۡ كِتَٰبٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٞ لِّمَا مَعَهُمۡ وَكَانُواْ مِن قَبۡلُ يَسۡتَفۡتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُواْ كَفَرُواْ بِهِۦۚ فَلَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ بِئۡسَمَا ٱشۡتَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡ أَن يَكۡفُرُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بَغۡيًا أَن يُنَزِّلَ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ فَبَآءُو بِغَضَبٍ عَلَىٰ غَضَبٖۚ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٩٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ ءَامِنُواْ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ نُؤۡمِنُ بِمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَيَكۡفُرُونَ بِمَا وَرَآءَهُۥ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَهُمۡۗ قُلۡ فَلِمَ تَقۡتُلُونَ أَنۢبِيَآءَ ٱللَّهِ مِن قَبۡلُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩١﴾ ۞ وَلَقَدۡ جَآءَكُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ ٱتَّخَذۡتُمُ ٱلۡعِجۡلَ مِنۢ بَعۡدِهِۦ وَأَنتُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿٩٢﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ وَرَفَعۡنَا فَوۡقَكُمُ ٱلطُّورَ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱسۡمَعُواْۖ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَأُشۡرِبُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡعِجۡلَ بِكُفۡرِهِمۡۚ قُلۡ بِئۡسَمَا يَأۡمُرُكُم بِهِۦٓ إِيمَٰنُكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٩٣﴾

دەکرد و یەکتریان دەردەکرد، بەڵام ئەگەر کەسێکیان بگیرایە دەیان وت: پێویستە لە سەرمان ماڵ کۆ بکەینەوەو رزگاری بکەین، چونکە بەنی ئیسرائیلییە، جا ماڵیان کۆ دەکردەوەو کابرایان رزگار دەکرد بۆ؟چونکە دەیان وت ئێمە یەهودیین‌و پێویستە لە سەرمان کەیارمەتی برای خۆمان بدەین. ئەی دەرنەکردنیشی هەر پێویست نەبو لە سەریان؟ بۆ ئاوا دەکەن؟! تۆڵەی هیچ کام لە ئێوە کە ئیشی ئاوەها دەکات نیە مەگەر سەرشۆڕی لە دنیاداو لە رۆژی قیامەتیش دا بۆلای سەخترین سزا دەگەڕێنرێنەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ئێوە باوەڕتان بە هەندێك لە تەورات هەیەو کەسێك لە جولەکە دەگیرێت لەسەر فەرمانی تەورات فیدیەی دەدەن‌و رزگاری دەکەن، بەڵام بێ باوەڕن بە هەندێکی تری کە دەفەرموێ: یەکتری مەکوژن‌و یەکتری لە ماڵەکانتان دەرنەکەن؟.لێرەدا ئەم هەڕەشەی بەنی ئیسرائیلیە هەڕەشەیشە بۆ تەواوی موسڵمانانی ئەمڕۆ، بۆ؟ چونکە کاتێ دەپرسی لە کابرا بۆ نوێژ دەکەی؟ دەڵێ ﷲدەفەرموێ، بۆ رۆژی دەگری؟ دەڵێ ﷲ دەفەرموێ، بۆ زەکات دەدەی؟ دەڵێ ﷲدەفەرموێ، بۆ ئەمر ناکەی بە چاکە؟ دەڵێ تاقەتم نیە. بۆ نەهی لە خراپە ناکەی؟ توانام نیە. بۆ، بۆ حاکمیەتی ئیسلام تێناکۆشی؟ دەڵێ ئەوە بەمن ناکرێت‌و توانام نیە، دەی ئەمە باوەڕ بە هەندێك لە قورئان‌و بێ باوەڕی بە هەندێکی نیە؟ بێگومانم کە ئێمەش هەمان سزامان هەیە، ﷲدەفەرموێ: لە دنیادا سەر شۆڕ دەبن. ئەوەتا ئێمە ئەمڕۆ زیاتر لەیەك ملیاردو نیو موسڵمانین بەڵام ئەوەندە بێ دەسەڵاتوبێنرخین لە جیهاندا هەتا ئیستا لەمێژوی ئیسلامدا شتی وانەبوە؟! چونکە راستە باوەڕمان بە هەندێکی قورئان هەیە وە ئیشی پێ دەکەین، بەڵام هەندێکی تریمان وازلێ هێناوەو کاری پێ ناکەین، جائەوە دنیامانە کە ئاوا سەرشۆڕین ئینجا سزای قیامەتیش کەبەکوێری حەشردەکرێین با لەولاوە بوەستێت، ساخوای گەورە کۆمەکمان پێ بکات کە پیاو بیین‌و خۆمان لەو سزایە رزگار بکەین. ئینجا دەفەرموێ: ﷲ بێ ئاگانیە لەوەی کە ئێوەدەیکەن.

﴿٨٦﴾ئەوانە کەسانێکن بۆ ئەوەی کە لە دنیادا خۆش رابوێرن‌و پلەو پایەیەکی بەرزو ژیانێکی خۆشیان هەبێت ژیانی دنیایان کڕیوە بە ئاخیرەت، وازیان لە قیامەت هێناوەو دژایەتی ئاینی خوا دەکەن، ئەوسا بەهۆی لاساریانەوە لە رۆژی قیامەت دا نە سزایان لەسەر سوك دەکرێتەوەو نە یارمەتیش دەدرێن بۆ رزگار بونیان. هەروا بە زەلیلی‌و سەرشۆڕی دەمێننەوە لەناوسزای قیامەتدا.

﴿٨٧﴾ ئێمە بە راستی ئەم کتێبەمان دا بە موسا کە تەوراتەو چەندین پێغەمبەرمان بە دوای ئەو دا هێنا. دیارە پێغەمبەرەکان تاکو گەیشتونەتە عیسا عليه السلام هەمویان پەیڕەویی تەوراتیان کردوەو هەر خەریکی بڵاوکردنەوەی تەورات بوون، وەدامان بە عیسای کوڕی مریەمیش نیشانەگەلی ئاشکراورون وەك ئینجیل‌وموعجیزەکانی‌و بەهێزمان کرد بە رۆحی پیرۆز کە ﷲ پێی دابو خەڵکی زیندو دەکردەوە کە ئەوە یەکێك بو لە موعجیزەکانی، یان مەبەست لە (روح القدس) جبرائیلە کە بەفەرمانی ﷲ یارمەتی دەدا، ئەی بەنی ئیسرائیلی ئەوە بۆ هەر کاتێك پێغەمبەرێك بهاتبایە لای ئێوە بە شتێك کە پێتان خۆش نەبوایە خۆتان بە گەورە دەزانی جا هەندێکتان بە درۆ دەخستنەوەو باوەڕتان پێ نەدەکردن‌و هەندێکیشتان شەهید دەکردن؟

﴿٨٨﴾ کاتێك کە ئامۆژگاری دەکران، دەیان وت: ئێمە دڵمان لە ناو پەردەدایە و هیچ نابیسێت نەخێر دانەخراوە بەڵکو ﷲنەفرینی لێ کردون بە بۆنەی کوفرو سەرکەشیانەوە، جا کەمێکیان باوەڕ دەهێنن‌و بە کەمێك لە ئیسلام باوەڕ دەکەن. (غلف) واتە: پەردە، هەروەکو چۆن دەڵێین خەنجەر لە غیلاف دایە وە شمشێر لە غیلاف دایە واتە: دڵی ئەوانیش لەناو پەردەدایەوراستی وەرناگرێت.

﴿٨٩﴾لە کاتێکدا کتێبێك هاتە لای ئەوان لە لایەنی خواوە کە ئەو کتێبە دانی دەنا بەوەی کە لە لای ئەوان بوە کە تەوراتەو ئەوان لە پێشدا هیوای سەرکەوتنیان بو بە سەر موشریکاندا بە هاتنی.

قُلْ إِن كَانَتْ لَكُمُ ٱلدَّارُ ٱلْـَٔاخِرَةُ عِندَ ٱللَّهِ خَالِصَةً مِّن دُونِ ٱلنَّاسِ فَتَمَنَّوُا۟ ٱلْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَن يَتَمَنَّوْهُ أَبَدًۢا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٩٥﴾ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٩٧﴾ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّلَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبْرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٩٨﴾ وَلَقَدْ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ وَمَا يَكْفُرُ بِهَآ إِلَّا ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَكُلَّمَا عَـٰهَدُوا۟ عَهْدًا نَّبَذَهُۥ فَرِيقٌ مِّنْهُم ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٠﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُصَدِّقٌ لِّمَا مَعَهُمْ نَبَذَ فَرِيقٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ كِتَـٰبَ ٱللَّهِ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ كَأَنَّهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾

ئەوە بو کە لە مەدینەدا هەڕەشەیان بەوە دەکردو دەیان وت پێغەمبەرێك دێت ئێمە دوای ئەو پێغەمبەرە دەکەوینو بە سەر ئێوەدا زاڵ دەبینو تۆڵەی خۆمانتان لێ دەکەینەوە، بەڵام کاتێ کە هات بۆ لای ئەوان ئەوەی کە دەیانناسیو دەیانزانی کە حەقەو ڕاستە باوەڕ یان پێ نەکرد، سا نەفرینی ﷲلە بێ باوەڕان کە ڕاستی دەزاننو پەیڕەوی ناکەن؟ لێرە بۆمان دەرکەوت کە هەر کەسێ حەقیقەت بزانێو لادات لەو حەقیقەتەو لاساری بکات کافر دەبێو بەر نەفرینو نەعلەتی ﷲ دەکەوێت.دەی ئایا زانینە ناودەرونیەکەیان کردنی بە باوەڕدار؟ دە فرەیدە ئەو قسە پوچانەی کەلەمو لەو دەبیسیت کەدەڵێن: ئیمان باوەڕی ناودەرونەوبەس.

﴿٩٠﴾ بە ڕاستی خۆیان بە شتێکی خراپ گۆڕییەوە، کە بێ باوەڕ بون بەوەی کە ﷲڕەوانەی کردبو، هەرچەند ئەو ڕەوانە کراوەشیان بە ڕاست دەزانی، بەڵام هەر لەبەر ئیرەیی بەوەی کە خوای گەورە شتێك لە بەهرەی خۆی بنێرێت بۆ کەسێك کەئارەزوی لێ بێت، پێیان وابو دەبێ پێغەمبەر هەر لە خۆیان بێت ونابێ ئەونیعمەتەی ﷲکە پێغەمبەرایەتیە بە کەسێکی تر بدرێت. واتە: دەیانزانی شتەکە ڕاستە، بەڵام لە بەر ئیرەیی باوەڕیان نەدەکرد، ئەوسا ئا بەم ئیشەی کە کردیان دوچاری غەزەبی یەك لە دوای یەکی ﷲبون چونکە لە هەمو ئیشێکیاندا دژایەتی فەرمانی خوایان دەکرد بۆیە وا غەزەب لە دوای غەزەب دەیگرتن بە ڕاستی بۆ ئەو کەسانەی کە کافرن سزایەکی گاڵتەپێ کەریان بۆ هەیە، سوکایەتیان پێ دەکرێت، واتە: سزایەك کە گاڵتەیان پێ دەکاتو ئیهانەیان دەکات چونکە ئەوان لە دنیادا گاڵتەیان بە بەرنامەی خوا کردوە جا سزاش بە گوێرەی عەمەلە وەك وتراوە (كَمَا تُدِينُ تُدَانُ: چۆن ڕەفتار بکەیت ئاوات لەگەڵدا دەکرێت).

﴿٩١﴾ هەر کاتێ پێیان بوترایە باوەڕ بێنن بەوەی کە ﷲ ناردویەتی دەیان وت: ئێمە باوەڕمان هەیە بەوەی کە ڕەوانە کراوەتە لامان کە تەوراتەو بێ باوەڕین بەوەی کە لەپاش ئەو هاتوە کە قورئانە لە کاتێکدا کە هەر ئەو ڕاستەو پێویستە باوەڕی پێ بکەن چونکە ئەو قورئانە دان دەنێ بەوەی کە لە لای ئەواندایە کە تەوراتەو بە ڕاستی دەزانێت، بەڵام ئەو بۆ سەردەمێك بووەو دەستکاریشیان کردوە، ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ئەی بۆچی لە پێشدا پێغەمبەرەکانی خوتان دەکوشت؟ کەواتە درۆ دەکەن ئەو کاتەش باوەڕدار نەبوون.

﴿٩٢﴾ بە ڕاستی موسا ﷺ بە نیشانە گەلی ئاشکرا هات بۆ لای ئێوە وەکو توفانو عەسایدەستیو بۆقو خوێنو کولەو ئەسپێو لەت کردنی بەردو شەق کردنی بەحر کە هەمویان نیشانەی ڕوونو ئاشکرا بون، وە دەیان نمونەی تر، کەچی کاتێ کە موسا ﷺ هات بۆ سەر کێوی تور هەر پاش ئەو ئێوە گوێرەکەتان کرد بە خوای خۆتانو پەرستتان بابزان کە بە ڕاستی ئێوە ستەمتان لە خۆتان کرد.

﴿٩٣﴾ بیر بکەنەوە لەو کاتەی کە ئێمە پەیمانی بتەومان لە ئێوە وەرگرتو کێوی تورمان بە سەر ئێوەدا بەرز کردەوەو پێمان وتن: ئەوەی کە پێمان داون بە قوەتو بەهێز وەریگرنو گوێی بۆبگرن، بەڵام ئەوان بە پێچەوانەوە ئیشەکەیان کرد کە وتیان: بیستمانو سەرپێچیمان کرد. دەگونجێ هەر بە ئاشکرا ئاوایان وت بێت کەبیستمانو بە گوێت ناکەین یان دەیانبیست بەڵام پشت گوێیان دەخست، جا بەهۆی خوا نەناسیانەوە خۆشەویستی گوێرەکە چوبوە ناو دڵیانەوە، ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەگەر ئێوە باوەڕدارنو باوەڕەکەتان شتی ئاوەهای پێ وتون بە ڕاستی بیرو باوەڕێکی خراپتان هەیە.

﴿٩٤﴾ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر بەهەشتو خۆشی ئەو ماڵەی دوا ڕۆژ تایبەتە بۆ ئێوەو بۆ خەڵکی تر نیە دەی با ئاواتی مەرگ بخوازن، ئەگەر ئێوە لەم قسانەتاندا ڕاست دەکەن چونکە لەو بەهەشتەو لەو نازو نیعمەتە خۆشتر نیە. خوای گەورە خۆی وەڵام دەداتەوەو دەفەرموێ:

(٩٥) بەدڵنیاییەوە هەرگیز ئەو ئاواتە ناخوازن. بۆ؟ چونکە خۆیان دەزانن چەند ئیشی خراپو تاوانیان ئەنجام داوەو بە راستی اللهزانایە بە ستەمکاران و ئەوانیش ستەمکارنو دەزانن کە سەرەنجام تۆڵەیان لێ وەردەگرێت.

(٩٦) ئەمانە نەك تەنها ئاواتی مەرگ ناخوازن بەڵکو تۆ دەبینی کەئەوان سوورترین خەڵکن لەسەر ژیانو مانەوەو هەندێك لەوانەش کە هاوەڵیان بۆ اللهداناوە ئاوات دەخوازن کە هەزار ساڵ تەمەنیان درێژ ببوایە، الله دەفەرموێ: ئەگەر ئەوەندەش تەمەنیان درێژ بێت با دڵنیابن کە لە سزای اللهدوریان ناخاتەوە چونکە رۆژێك لە رۆژان دەگەڕێنەوە بۆلای اللهبۆ حیسابو تۆڵە، بە راستی اللهبینەرە بەوەی کە ئەوان دەیکەن. بەم شێوەیە بۆمان دەرکەوت کە کێ ژیانی خۆش دەوێت، مرۆڤی موسڵمان دەبێ ئاگای لە خۆی بێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُمْ /أبوداود. حسنه الالبا / هەر کەسێك خۆی بە گەلێك بچوێنێ ئەوسا ئەوەلەوانە}

جا ئەگەر ئێمەش بە دوای دنیا کەوتینودنیامان لا خۆشەویست بو ئێمەش وەك ئەوانمان لێ دێت هەروەك چۆن پێغەمبەرﷺ لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ: {يُوشِكُ الْأُمَمُ أَنْ تَدَاعَى عَلَيْكُمْ كَمَا تَدَاعَى الْأَكَلَةُ إِلَى قَصْعَتِهَا فَقَالَ قَائِلٌ وَمِنْ قِلَّةٍ نَحْنُ يَوْمَئِذٍ قَالَ بَلْ أَنْتُمْ يَوْمَئِذٍ كَثِيرٌ وَلَكِنَّكُمْ غُثَاءٌ كَغُثَاءِ السَّيْلِ وَلَيَنْزَعَنَّ اللَّهُ مِنْ صُدُورِ عَدُوِّكُمْ الْمَهَابَةَ مِنْكُمْ وَلَيَقْذِفَنَّ اللَّهُ فِي قُلُوبِكُمْ الْوَهْنَ فَقَالَ قَائِلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْوَهْنُ قَالَ حُبُّ الدُّنْيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوْتِ /أبوداود، صححه الالبا / نزیکە ئوممەتانی کوفر گەلە کۆمەتان لێ بکەنو پەلامارتان بدەنو بتان خۆن هەروەکو چۆن کۆمەڵێکی برسی پەلاماری خوانێکی ئامادەکراو دەدەن، کەسێك وتی: ئەو رۆژە لەبەر کەمیمان وامان لێدێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵکو ئەو رۆژە ئێوە زۆرن، بەڵام ئێوە وەك کەفو بڵقی سەر لافاو وان، الله لە ناخی ئەواندا ترسو سامی ئێوە لا دەباتو "وەهن" دەخاتە ناو دڵەکانی ئێوەوە، کەسێك وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ "وەهن" چییە؟ فەرموی: خۆشویستنی دنیاو رق بونەوەیە لە مردن}

بەڵێ ژیان بۆ دنیا دینو دنیات دەبات، گەر بۆدین بێت دینو دنیات پێ دەدات، کەواتە موسڵمان دەبێ خۆشەویستی دنیای نەوێت تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە عیبادەتی خوای تێدا بکات، ئەمە بەو مانایە نیە کە موسڵمان تەرکی دنیا بکات بەڵکو پێویستە دنیای بە فرسەت بزانێ بۆ قیامەتی.

جووەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کرد کە کێ وەحیت بۆ دێنێت؟ فەرموی :جبرەئیل، وتیان: ئەگەر میکائیل بوایە باوەڕمان دەهێنا، بەڵام چونکە جبرەئیلە باوەڕ ناهێنین چونکە ئەو مەئموری عەزابەو هەر کاتێك کە عەزاب هات بێتە سەر ئێمە جبرەئیل هێناویەتی لە بەر ئەوە رقمان لێیەتی. خوای گەورە بە توندی لەدەمیان دەدات و تێمان دەگەیەنێ کە ئەم دینە هەرخۆی ئایینی دابین کردنی بەرژەوەندییەکانەو لادان لە بچوکترین یاسای دژی بەرژەوەندی مرۆڤە.

(٩٧) ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەو کەسەی کە دوژمنی جبرائیلە سا بێگومان هەر ئەوە دادەبەزێت بۆ لای تۆو هەر ئەوەکە بە فەرمانی اللهوەحیت بۆ دێنێت، خۆی ناتوانێت لە خۆیەوە هیچ شتێك بێنێت، دان دەنێت بەوەی کە لە پێش ئەم قورئانەدا هاتوە وەك، تەورات، ئینجیل وەزەبوور، رێ پیشاندەرو مژدە دەرە بۆ باوەڕداران، مژدەیان دەداتێ بە بەهەشتو پاشەرۆژێکی خۆش .

دیارە قورئان هیدایەتو مژدە دەرە بۆ هەمو کەسێك، بەڵام چونکە هەر باوەڕداران سودی لێ وەردەگرن وەك ئەوە وایە کە هەر بۆ ئەوان هات بێت. ئینجا بە فەرمانێکی گشتی دەفەرموێ:

(٩٨) ئەو کەسەی کە دوژمنایەتی خوداو فریشتەکانیو پێغەمبەرانی و جبرەئیلو میکائیل بکات کافر ئەبێت، ئەوسا بێگومان خوداش دوژمنی کافرانە، جبرەئیلو میکائیل دوو فریشتەن لە فریشتەکان، هەر بەوشەی ﴿ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ ﴾ دا بەر دەکەون بەڵام بۆ زیاتر رێزلێ گرتنیانو بۆ دەم کوتکردنی جووەکان لە پاشدا ناوی ئەو دوو فریشتەیەی جیا کردەوە.

(٩٩) بەراستی ئێمە ناردومانە بۆ لای تۆ ئەی محمد ﷺ چەندین ئایەتی رۆشنو ئاشکرا کە ئەو قورئانەیەو ئەو رستە جوانو پڕ ماناو پڕ موعجزانەیە کە کەسێك نەیتوانیوەو ناشتوانێ سورەتێکی بچووکی وێنەی ئەم قورئانە بهێنێت، خۆ بێ باوەڕ نابێ بەو ئایەتانە مەگەر گەلێ لە سنورتێ پەڕیو فاسق.

جا دووبارە بۆ ئەوەی کە زیاتر سەرکۆنەیان بکاتەوەو تێیان بگەیەنێت کە باوەڕ نەبونی ئێستایان بەم قورئانە خوویەکی تازەی ئەوان نیە، بەڵکو بۆ هەمو پەڕاوەکانی تری پێش قورئانیش هەروا بوون وەك خوای گەورە دەفەرموێ:

(١٠٠) ئایا وانیە کە هەر کاتێك پەیمانێکیان داوە تاقمێك لەوان پەیمانەکەی خۆیان فڕێ داوە؟ بەڵکو زۆربەی ئەوان باوەڕیان هەر نەهێناوە. واتە: ئەی محمد ﷺ ئەمە نەریتێکی تازەی ئەوان نیە بەڵکو ئەوان هەر ئاوەها بوون لە دژایەتی بەرنامەی خوادا.

(١٠١) کاتێك کە هاتە لای ئەوان نێرراوێك لە لایەنی خواوە کە محمدە ﷺ کەدان دەنێ بەو کتێبو پەڕاوانەی کە لەلای ئەوان بووە، هەندێك لەوانە کە ئەهلی کیتاب بون وەك جوولەکەو فەلەکان، ئەمانە پەڕاوەکانی خوایان فڕێ داو خستیانە پشت

گوێیانەوە وەك ئەوەی كە قەت شتی وایان نەزانی بێت، پێویستە ئەوە بزانین كە هەم لە تەوراتو هەم لە ئینجیلدا باسی هاتنی پێغەمبەرو سیفەتەكانی كراوە بۆ ئەوانو زۆر چاك دەیانزانی، بەڵام كاتێ كە پێغەمبەرﷺ هات هەمو باسێكی ئەویان خستە پشتگوێ وەك ئەم كتێبەیان هەر نەزانی بێتو هیچیان لە بارەی پێغەمبەرەوە بۆ نەهاتبێت چونكە ئەگەر بە گوێی پەڕاوەكەی خۆیان بكردایە دەبوایە باوەڕیان بە پێغەمبەر ﷺ بكردایە.

ئینجا لێرەدا داستانێكی ترمان بۆ باس دەكات كە بەنی ئیسرائیلی سەبارەت بە سلێمان‍ؑ دروستیان كردبو كەدەیان وت: سلێمان كاتی خۆی بە سیحر توانیویەتی جنۆكەكان رام بكاتو ئیشیان پێ بكات، ئیتر پێغەمبەرایەتیان لە بیری خەڵك بردەوەو چەند چیرۆكێك دەگێڕنەوە، یەكێك لەوانە ئەوەیە: دەڵێن: كاتێك كە سیحر بڵاو بویەوە سلێمان رێگری لێكردنو كتێبەكانی سیحری گرتنو لە ژێر كورسیەكەی خۆی دا شاردنیەوە ئیتر نە جنۆكەو نە مرۆڤ نەیانتوانیوە بە دەوری دا بڕۆن هەتا ئەو كاتەی كە سلێمان وەفاتی كرد، ئینجا شەیتان بە شێوەی مرۆڤێك هاتو بە خەڵكەكەی وت: ژێری كورسیەكەی هەڵكەنن موڵكێكی گەورەتان دەست دەكەوێت، هەڵیان كەندو كتێبەكانیان لەوێ دەرهێنا، ئینجا شەیتان پێی وتن بەڵێ كاتی خۆی سلێمان بە ئەمانە توانیویەتی زاڵ بێت بە سەر خەڵكدا، ئینجا ئاوەها بڵاو بویەوە كە بەڵێ سلێمان سیحری بە كار هێناوەو بە سیحر ئیشەكانی كردوە. خوای گەورەش بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

(١٠٢) دوای ئەوە كە شەیتانەكان دەیان خوێندەوە سەبارەت بە دەسەڵاتو موڵكی سلێمان، واتە دەیان وت: سلێمان بە هۆی ئەم سیحرانە بوە بە خاوەنی ئەم زەویە ﷻ دەفەرموێ سلێمان كافر نەبو، بەڵكو پێغەمبەرێكی خوا بو بەڵام شەیتانەكان پێی بێ باوەڕ بوونو كافر بون كە خەڵكیان فێری سیحر دەكرد.

لە رستەی ﴿ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ ﴾ وشەی (مَا) بە دوو مانا تەفسیرزانان مانایان كردوە هەندێكیان دەڵێن: (ما) كە (ما)ی نەفیە وە هەندێك دەڵێن (ما) كە بە مانای (الذي) یە واتە شەیتانەكان كافرنو خەڵكیان فێری سیحر دەكرد، ئەگینا هیچ شتێك نەهات بو بۆ ئەو دوو فریشتەیە كە ناویان هاروت و ماروت بو ئەو دوو فریشتەیە هیچ كەسێكیان فێر نەئەكرد هەتا پێیشیان دەوتن ئێمە هەر تاقی كەرەوەین، جا خۆتان كافر مەكەن. ئەمە لەسەر مانای یەكەمی (ما)كە لەسەر مانای دووهەم: واتە شەیتانەكان كافربونو خەڵكیان فێری سیحر دەكردو ئەوەش كە هات بو بۆ ئەو دوو فریشتانە كە گوایە ئەوانیش سیحریان بۆ هاتبوو بۆ تاقیكردنەوەی خەڵك، راستەو خۆ بە خەڵكەكەیان

وَٱتَّبَعُواْ مَا تَتۡلُواْ ٱلشَّيَٰطِينُ عَلَىٰ مُلۡكِ سُلَيۡمَٰنَۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيۡمَٰنُ وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلۡمَلَكَيۡنِ بِبَابِلَ هَٰرُوتَ وَمَٰرُوتَۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنۡ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحۡنُ فِتۡنَةٞ فَلَا تَكۡفُرۡۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنۡهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَزَوۡجِهِۦۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنۡ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡۚ وَلَقَدۡ عَلِمُواْ لَمَنِ ٱشۡتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖۚ وَلَبِئۡسَ مَا شَرَوۡاْ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمۡۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ (١٠٢) وَلَوۡ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَمَثُوبَةٞ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ خَيۡرٞۖ لَّوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ (١٠٣) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا وَٱسۡمَعُواْۗ وَلِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٞ (١٠٤) مَّا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَلَا ٱلۡمُشۡرِكِينَ أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ خَيۡرٖ مِّن رَّبِّكُمۡۗ وَٱللَّهُ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ (١٠٥)

دەوت كە خۆتان فێری سیحر مەكەن چونكە كافر دەبن هەتا بە خەڵكەكەیان دەوت ئێمە هاتوین بۆ تاقیكردنەوەی ئێوە، خۆتان كافر مەكەن، فێری سیحر مەبن، داوای سیحر لە ئێمە مەكەن، بەڵام ئەگەر داوامان لێ بكەن پێتان دەڵێین: واتە لە پێشەوە دەیانترساندن، بەڵام هەندێكیان هەر دەپاڕانەوە لێیانو ئەوانیش بۆ تاقیكردنەوە رۆیشتبون فێریان دەكردن، جا لەو دوو فریشتەیەوە فێری ئەوە بون كە بتوانن ژنو پیاو لە یەكتر جیا بكەنەوە، واتە: ئیشی خراپ فێر بونو شەیتانیش هەر ئاوەهایە، بەڵام ئەوەش بزانن كەئەوان ناتوانن هیچ زیانێك بە كەس بگەیەنن مەگەر بە فەرمانو ئیزنی خوا. واتە هەمو شتێك لە دەسەڵاتی خوادایە، بەڵام مرۆڤ خۆی سەرپشكە بۆ هەڵبژاردنی ئیشی چاك یان خراپ هەر كامیانی هەڵبژارد ﷻ یارمەتی دەدات. كەواتە هەموی لە ژێر ئیزنو دەسەڵاتی خوادایە، بە بێ یارمەتی ئەو هیچ شتێك ناكرێت، خوای گەورە قوەتو هێز ئەداتو كابرا هەڵبژاردنی شتەكە دەكات، وە فێری ئەو شتە دەبون كە زیانیان پێ بگەیەنێتو سوودیان پێ نەگات، واتە: تەنها فێری زیانگەیاندن دەبون نە فێری قازانج، بە راستی زانیان ئەو كەسەی كە خۆی فێری سیحر دەكات لە رۆژی دواییدا بێ بەشو نائۆمێدە واتە دەیانزانی كە سیحر شتێكی قەدەغەیە.

(خَلَاق) بەش، نسیب. بە راستی ئەگەر بزانن بە شتێكی خراپ نەفسی خۆیان گۆڕیەوە، واتە ئەگەر زانا بونایە شتی وایان نەدەكرد كە بۆ بەهرەیەكی كەم ژیانێكی هەتاهەتایی لە دەست

۞ مَا نَنسَخۡ مِنۡ ءَايَةٍ أَوۡ نُنسِهَا نَأۡتِ بِخَيۡرٖ مِّنۡهَآ أَوۡ مِثۡلِهَآۗ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٠٦ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ١٠٧ أَمۡ تُرِيدُونَ أَن تَسۡـَٔلُواْ رَسُولَكُمۡ كَمَا سُئِلَ مُوسَىٰ مِن قَبۡلُۗ وَمَن يَتَبَدَّلِ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٠٨ وَدَّ كَثِيرٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَوۡ يَرُدُّونَكُم مِّنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِكُمۡ كُفَّارًا حَسَدٗا مِّنۡ عِندِ أَنفُسِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَٱعۡفُواْ وَٱصۡفَحُواْ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ ٱللَّهُ بِأَمۡرِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٠٩ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١١٠ وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١ بَلَىٰۚ مَنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ فَلَهُۥٓ أَجۡرُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١١٢

بدەن. به داخەوە زۆربەی خەڵك بۆ ژیانێكی كاتی جیهانێكی هەتا هەتایی له دەست خۆی دەدات.

(١٠٤) ئەگەر ئەوانه باوەڕیان بهێنایەو تەقوایان ببوایه دەیانزانی كه بچوكترین پاداشتی لای ﷲ چاكترە بۆیان له هەمو دنیا، بەڵام دیارە نەزانبون بۆیه بۆ شتێكی كاتی ئەو پاشەڕۆژەی خۆیان سوتاند، واته: پێویسته مرۆڤی زانا بیر له دوا ڕۆژی ئیشی خۆی بكاتەوە نەك بیر هەر لەوكاته بكاتەوە كه تێیدا دەژی ئەو سیحرە زۆر باو بوە لەو كاتەداو ئێستاش شەیاتین هەر هەن بۆ ئەنجام دانی سیحر.

خوێندنی ئەم چەند ئایەتەو سەرەتای سوورەتی بەقرە تاكو ئایەتی ﴿ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ٥ ﴾ و خوێندنی ئایەتی ﴿ وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ ... ﴾ كه دوو ئایەته لەگەڵ ئایه الكرسیو دوو ئایەتی دوای ئایەته الكرسیو سێ ئایەتی كۆتایی سوورەتی بەقرە چاكن بۆ بەتاڵ كردنەوەی سیحر.

(١٠٣) ئەی خاوەن باوەڕان نەڵێن به محمد ﷺ سەرپەرشتمان، بڵێن بنوارەو تەماشامان بكەو ئێوەیش گوێ بگرن بەراستی بۆ كافران سزایەكی بەژان هەیه. ئیبنو عەباس دەڵێت: هەركاتێك قورئان فەرموی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ چاك گوێی بۆ شل بكەن چونكه یان داوا كردنی خێرێكه دەی ئێوەش بیكەن یان شتێكی پڕ مەترسیەو دەتان ترسێنێ ئێوەش مەیكەن. وشەی (راعنا) واته شوانو سەرپەرشتمان ئەمەله پێشدا له مەكه موسڵمانان به پێغەمبەریان دەوت، بەڵام كاتێك كه چونه مەدینه ئەم وشەیه بەزمانی جووەكان به مانای (ئازاردەرەكەمان) بو، واته ئەی ئەو كەسەی كه مایەی ئازاری بۆمان. جا جووەكان بەم مانایه به كاریان دەهێناو لەدڵدا پێخۆشحاڵ دەبون چونكه جنێوبو، خەڵك وایان دەزانی كەدەڵێن ئەی سەرپەرشتەكەمان، ئەگەر چی وشەكه وشەیەكی جوانه بەڵام چونكه نیەتیان خراپ بو، هەمو خاوەن باوەڕان له وتنی ئەو وشەیه قەدەغه كران ئەمەش بۆ ئێمەیه كه فڕوفێڵ له ئاینی خوادا نەكەینو دڵنیا بین كه خوای گەورە ئاگای له ناو دڵمانەو هیچ شتێكی لێ ناشارێتەوە. واته ئەوانەی كەدژایەتی پێغەمبەر ﷺ دەكەنو ئازاری دەدەن با به نیەتیش بێت ئەوانه كافرانو پاشه ڕۆژێكی پڕ مەترسیان هەیه. ئینجا پەروەردگارمان ئاگادارمان دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(١٠٥) هەرگیز نه ئەهلی كتێبونه هاوەڵ دانەران ئاواتیان ئەوە نیه كه ئێوە لەلایەن پەروەردگارتانەوە خێر وچاكەیەكتان دەست كەوێت بەڵام ئەوە نەبێت كه خواش به دڵی ئەوان بكات بەڵكو خوای گەورە خۆی تایبەت دەكات به ڕەحمەتی خۆیەوە ئەو كەسەی ئارەزۆی لێ بێت، كەسیش ناتوانێت ڕێگای لێبگرێت. ئەمه بەر پەرچدانەوەی ئەو قسانه بو كه سەبارەت به هەندێ شت دەیانكرد بۆ نمونه: وەكو گۆڕانی قیبله له پێشەوە (**بیت المقدس**) بو، پاشان كه چونه مەدینه ڕوو كرایه كەعبه، ئینجا جووەكان كەوتنه پڕوپاگەندە بڵاو كردنەوە لەدژی پێغەمبەر ﷺ وئاینەكەی و دەیان وت محمد ﷺ هەر ڕۆژێك بەرەولایەك ڕوو دەكات جا خوای گەورەش دەفەرموێ:

(١٠٦) هیچ ئایەتێك ناسڕینەوە یان هیچ بڕیارێك دواناخەین مەگەر چاكتر یان وێنەی ئەو بڕیارە بهێنین. ئینجا بۆچی دەیگۆڕێت؟ ئەوە خۆی دەزانێت ﴿ پرسیار ناكرێت لەخوا كەچی دەكات، بەڵكو ئەوان پرسیاریان لێ دەكرێت ﴾ ئایا تۆ نازانی كه بێگومان خوای گەورە توانای به سەر هەمو شتێك دا هەیه؟ دەی كەواته ئەو گۆڕانكاریانه شتێكی زۆر ئاسانه بۆ ﷲ.

وشەی (استنساخ) بۆ گواستنەوەو بۆ سڕینەوە به كار دێت لێرەدا بۆ سڕینەوەی بڕیارەكانو نەهێشتنی هەندێك له فەرمانەكان به كار هێنراوە، زانایان واتای "النسخ" بەم شێوە كورت دەكەنەوەو دەڵێن: (رَفْعُ الْحُكْمِ بِدَلِيلٍ شَرْعِيٍّ مُتَأخر: لابردنی بڕیارێكه به بەڵگەیەكی شەرعی كه دواتر هاتبێ) كه ئەم نەسخو سڕینەوەش قسەی زۆربەی زانایانەو دژایەتی كردنی كارێكی ئاسان نیه.

﴿١٠٧﴾ ئایا تۆ نازانی کە بێگومان خاوەنی ئاسمانانو زەوی هەر خوایە؟ وە بۆ ئێوە بێجگە لە اللههیچ دۆستو یارمەتی دەرێکی ترتان نیە؟

﴿١٠٨﴾ یان دەتانەوێ پرسیار بکەن لە پێغەمبەرەکەتان کە محمدە ﷺ وەك ئەو پرسیارانە کە لەپێشدا لەموسایان دەکرد؟ واتە: شتی وا نەکەنو پرسیاری زۆرو بێ سود مەکەن، بە راستی یارەکانی پێغەمبەر ﷺ زۆر چاك بڕیارەکانی قورئانیان ئەنجام دەدا ئەوەتە لەم بارەیەوە قورئان نزیکەی دوانزە پرسیاری یارەکانی پێغەمبەری ﷺ تۆمار کردوە کەئەمە نیشانەی راستی باوەڕو بەرزی خوڕەوشتیانە، ئینجا دەفەرموێ: هەر کەسێك باوەڕ بە کوفر بگۆڕێتەوە بە راستی لەراستە رێگا لای داوەو گومڕایە. لە فەرمودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە هیچ تاوانێ لەوە گەورەتر نیە کە پرسیار بکرێت جا بە هۆی ئەو پرسیارەوە شتێك کە حەڵاڵە حەرام بکرێت لە ئوممەتم، ئەم حەڵاڵو حەرام کردنە لە کاتی پێغەمبەر ﷺ دا هەبووە تازە هیچ شتێك بە بۆنەی پرسیارەوە ناگۆڕێت، بەڵام پرسیاری زۆر ئێستاش هەر باش نیە وەك لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە کە دەفەرموێ خوای گەورە سێ شتی پێ ناخۆشە کە لەناو ئێوەدا هەبێت:{قِيلَ وَقَالَ وَكَثْرَةَ السؤَالِ وَإِضَاعَةَ الْمَالِ/منفق عليه/ بێژارو وتی گێڕانەوەی قسەی خەڵك چونکە دەگونجێ بەشێکی درۆ بێت هەروەها زۆر پرسیار کردنو فەوتانوزایەکردنی ماڵ}

جا کەواتە هەروەك ئایەتەکە رێنمایی موسڵمانانی کردوە لەو کاتەدا بۆ ئەمڕۆش پێغەمبەرمان ﷺ تێیگەیاندین کە زۆر پرسیار نەکەینو پرسیارێك بکەین کە بەسوود بێت و بۆ زانینی راستیەکان بێت نە بۆ تەریق کردنەوە یان گێرە شێوێنی. ئینجا خوای گەورە دڵ پیسی دوژمنەکانمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٠٩﴾ زۆرێك لە ئەهلی کتێب ئاوات دەخوازن کە پاشگەزتان بکەنەوەو دەستتان پێ بکێشنەوە لە باوەڕو کافر ببن، جا ئەمە لەبەر ئەوە نیە کە ئێوەیان خۆش بوێت یان پێیان وابێ کە کوفرەکەی خۆیان چاکترەو ئیشەکەی ئێوە خراپە، نەخێر لە بەر ئەوە نیە بەڵکو هەر حەسوودنو نایانەوێ کە ئێوە دوای پێغەمبەر ﷺ بکەونو بگەن بەو هەمو نازو نیعمەتو بەهەشتە خۆشە پاش ئەوەی کە حەقیان بۆ رۆشن بوەتەوە چونکە ئەوەندە هاتنی ئەوپێغەمبەرەیان بەلاوە راست بو ئەوەبو هەڕەشەیان دەکرد لە خەڵکی مەدینە کە پێغەمبەرێك دێت بەم ناونیشانەو ئێمە دوای دەکەوینو هەموتان لە بەین دەبەین، بەڵام کە زانیان ئەوان باوەڕیان پێ هێناوە ئیتر هەمو راستیو حەقێکیان شاردەوەو دەستیان کرد بە تانەو تەشەردان لە پێغەمبەر ﷺو بەرنامەکەیو زۆر هەوڵیان دەدا کە خاوەن باوەڕان کافر بکەنەوە، بەڵام ئیسلام دینی رەحمەتە بۆیە دەفەرموێ: سا ئێوە چاوپۆشیان لێ بکەنو قسەی ناشیرینیان پێ مەڵێنو پشتیان تێ بکەنو هەوڵی تۆڵە کردنەوە مەدەن هەتا ئەمرو فەرمانی خوا لەو بارەوە دێت بۆ لاتان. ئینجا هەندێك دەڵێن کە ئەم ئایەتە مەنسوخە بە ئایەتی (قتال) کە دەفەرموێ:﴿ئێوە هەموتان بەیەکەوە بەگژ بت پەرستاندا بچن هەروەك ئەوان بەگەلە کۆمەکی دێن بە گژی ئێوەداو بزانن کە الله لەگەل پارێزکاراندایە﴾تەوبە:٣٦،

بەڵام دەگونجێ هەر مەنسوخ نەبێت بۆ؟ چونکە ئەمە عەفوو کردنو چاوپۆشیە کە رەوشتێکی بەنرخو بەرزی ئیسلامیە لە هەمو سەردەمێکدا پێویستە، واجارێکی تر خەڵك گەڕاوەتەوە بۆسەردەمی نەفامیو پێویستی بەبانگەوازو رۆشن کردنەوەی ئایین هەیەو موسڵمانان نابێ هەر کەسێك قسەیەکی ناشیرینی پێ وتن شەڕی لەگەڵ دا بکەن یان بیکوژنو لە بەینی ببەن مەگەر کاتێ کە هەڕەشە لەبونو ژیانت بکرێت، بێگومان کاتێ کە تۆ دەعوەت دەکەیو بانگەوازی خوا دەگەیەنی بەو خەڵکە مرۆڤی نەفامو نەزانو ئەهلی کتێب دوژمنایەتیت دەکەنو قسەی ناشیرینت پێ دەڵێن، جا تۆ هەوڵی تۆڵە کردنەوە مەدە بەڵکو چاوپۆشی بکە لە هەندێ ئێشو ئازارو غەیبەتو جنێوو بوختان کە پێت دەڵێنو پێت دەکەن، چونکە ئەرکی سەر شانی تۆ ئالەم قۆناغەدا گەیاندنی ئاینی خوایە بە خەڵكو چاوپۆشی کردنە لە هەڵەکانیان تا موسڵمانان خۆیان دەگرنو بە هێز دەبنو هەر کاتێك موسڵمانان هێزو قوەتیان پەیدا کرد با رانەوەستن هەتا حاکمیەتی خوا دادەمەزرێت، جا تا ئەو کاتە تۆ تەنها پشتیان تێ بکە، بەڵکو ئەو پشت تێکردنە کاری خۆی بکاتە سەر ئەو خەڵکەو هەمو بەختەوەر ببن، دەبێ مەبەستی تۆی موسڵمانیش هەر ئەوە بێت چونکە بەرنامەی تۆ بەرنامەی پێغەمبەرە ﷺو خوای گەورەش بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردوە کە رەحمەت بیت بۆ هەمو جیهان﴾ئەنبیا/١٠٧

بێگومان خوای گەورە دەسەڵاتی بە سەر هەمو شتێکدا هەیە، کە ئەمە هەڕەشەیەکە لە کافران با وا نەزانن کە دەست درێژیو قسەی ناشیرینو دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا ﷺو هەوڵدان بۆ پاشگەز کردنەوەی موسڵمانان هەروا بۆیان دەچێتە سەرو رزگار دەبن لە دەست تۆڵەی خوا، پێویستە موسڵمانانیش خۆگرو ئارام بنو بەردەوام بن لەسەر گەیاندنی بەرنامەکەی خواو کەمتەرخەمی نەکەنو هەمیشە سوور بن لەسەر هێنانی خێرو خۆشی بۆ خۆیانو بۆ خەڵکی ترو پەیوەندیەکانی نێوان خۆیان وخواو خۆیانو خەڵك توندو تۆڵتر بکەن.

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ لَيۡسَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَىٰ لَيۡسَتِ ٱلۡيَهُودُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُمۡ يَتۡلُونَ ٱلۡكِتَٰبَۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ مِثۡلَ قَوۡلِهِمۡۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن مَّنَعَ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ أَن يُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ وَسَعَىٰ فِي خَرَابِهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ مَا كَانَ لَهُمۡ أَن يَدۡخُلُوهَآ إِلَّا خَآئِفِينَۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١١٤﴾ وَلِلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ فَأَيۡنَمَا تُوَلُّواْ فَثَمَّ وَجۡهُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿١١٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ بَل لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ كُلّٞ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿١١٦﴾ بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَإِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿١١٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ لَوۡلَا يُكَلِّمُنَا ٱللَّهُ أَوۡ تَأۡتِينَآ ءَايَةٞۗ كَذَٰلِكَ قَالَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّثۡلَ قَوۡلِهِمۡۘ تَشَٰبَهَتۡ قُلُوبُهُمۡۗ قَدۡ بَيَّنَّا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴿١١٨﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ بِٱلۡحَقِّ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗاۖ وَلَا تُسۡـَٔلُ عَنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١١٩﴾

(١١٠) جا نوێژەکانتان ڕێك و پێك بکەن و زەکات بدەن و دڵنیابن ئەوەی کە پێشی دەخەن بۆ خۆتان و ئەو ئیشە چاکەی کە دەیکەن لە لای خوا دەستتان دەکەوێتەوە، بە ڕاستی خوا بەوەی کە ئێوە دەیکەن بینەرەو چاوی لێیەو ئیشەکانتان لەبەر چاویەتی، هەر ئیشێکی چاکت کرد مادام بەتاڵی نەکەیتەوە ئەوە ئیتر زەخیرەیەکەو بۆت دەمێنێتەوەو بێگومان لەڕۆژی قیامەتدا لە لای خوای خۆت دەستت دەکەوێتەوە، وەك دەفەرموێ:﴿ ئەوەی لای خۆتانە دەفەوتێت و هیچی نامێنێت ـ نە ماڵ و نە منداڵ و نە سەرمایەو نە چاوو نە گوێ و نە هێزو نە لەش هەموی لە بەین دەچێت بەڵام ـ ئەوەی کە لەلای خوایە هەموی دەمێنێتەوە﴾ نەحل/٩٦.

(١١١) جوولەکەو فەلە دەیان وت: بێجگە لە جوولەکەو فەلە کەس ناچێتە بەهەشتەوە ئەوە ئارەزۆی ئەوانە، ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن چ بەڵگەیەکتان هەیە لەسەر ئەم قسانەتان بیهێنن. ئاشکرایە کە ئەمانیش هەر یەکەیان خۆی بە ڕاست دەزانی و ئەمە کۆی قسەی هەردوو لایە خوایش بەم شێوەیە دەمکوتیان دەکات ودەفەرموێ:

(١١٢) وا نیە کە ئەوان بۆی دەچن ئەو کەسەی بە تەواوی خۆی تەسلیم بکات و گەردن کەچ بێت بۆ فەرمانەکانی خواو ئەو چاکە کاریش بێ، ئەوسا بۆ ئەو هەیە پاداشت لە لای خوای خۆی و هیچ ترسێکیان نیەو خەم ناخۆن لەو ڕۆژەی کە دێتە پێشەوە. یەکێك لە مانای (احسان) ئەوەیە کە مرۆڤ عیبادەتی خوا بکات و وا بزانێ کە خوا دەیبینێت چونکە پرسیار لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرا (ما الاحسان؟) فەرموی: {ئەوەیە کە تۆ خوا بپەرستی وەکو ئەوەی کە ئەیبینی ئەگەر تۆ خوا نابینیت خوا تۆ دەبینێت} هەر کەسێك وای لێهات لە ئیحسان دایەو بەو کەسە دەگوترێت چاکە کار (محسن). بزانە ئەم ئایەتە لە ئەوەڵەوە تا ئەگاتە ﴿وَهُوَ مُحۡسِنٞ﴾ بە تاکی هاتوە لە ئاخرەکەیدا بە کۆ هاتوە چونکە بە تەرتیب ڕعایەتی لەفزو مانای (مَن) کراوە کە لەفزەکەی تاکەو ماناکەی کۆیەو ئەم جۆرە لەقورئاندا زۆرەو لێرە ئەوە بزانە بۆ شوێنەکانی تر.

(١١٣) جوولەکە دەیان وت: فەلە لەسەر هیچ شتێك نین و بەرنامەیان هەڵەیە و فەلەکانیش دەیان وت: جوولەکە لەسەر هیچ شتێك نین و بەرنامەیان هەڵەیە لەگەڵ ئەوەشدا هەردووکیان کتێبیان دەخوێننەوەو جووەکان تەوراتیان دەخوێندەوەو دەیانزانی ئەو پێغەمبەرەی کە لە دوایدا دێت ڕاستەوفەلەکانیش ئینجیلیان دەخوێندەوەو دەیانزانی موسا ؑ ڕاست بووەو بۆ پشگیری موسا ؑ ئینجیل هاتووە، عیسا ؑ بۆ پشتگیری موسا ؑ هاتوە. کەوابو لە ڕاستی دا قسەی هەردووکیان درۆیە کاتی خۆی هەردووکیان لەسەر حەق بوون. جوولەکەی ڕاست لەسەر حەق بوە تا هاتنی ئینجیل وە گاوری ڕاستیش لەسەر حەق بوە تا هاتنی محمد ﷺ ، وە لە لایەکی ترەوە هەردووکیان قسەیەکی ڕاستیان وتووە نە جوولەکە لەسەر هیچەو نە گاور لەسەر هیچە. ئینجا الله دەفەرموێ: ئەوانەش کە هیچ شتێك نازانن هەر وێنەی قسەی ئەوانیان دەکردو ئەوانیش دەیان وت: نە جوولەکەو نە گاور هیچ کامێکیان ڕاست نین تەنها ئێمە ڕاستین، ئێمە لەسەر دینی ئیبراهیمین و ئیبراهیم موشرك بوە، ئەوسا لە ڕۆژی قیامەتدا خوا حوکم ئەکات لە نێوانیاندا لەبارەی ئەو شتەوە کە ئەوان تێیدا ناکۆکن، جا هەر کەسێ لێ پێچینەوەی خۆی لەگەڵدا دەکرێت و تۆڵەی خۆی وەردەگرێ لەسەر ئەو ئیشە خراپانەی کە کردویەتی.

(١١٤) کێ هەیە زاڵم تر لەو کەسەی کە ڕێگری لە یادی خوا بکات لە ماڵەکانی خواداو هەوڵ دات بۆ خراپ کردنی مزگەوتەکان؟ نە ئەبوایە ئەوانە بچوونایە ئەو مزگەوتانەوە مەگەر بۆ یادی خواو لە ترسی ئەو بێ، بۆ ئەوانە هەرلە دنیادا سەر شۆڕیو لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە، واتە: مافی هیچ کەسێك نیە کە مزگەوتەکانی خوا قەدەغە بکات لە زیکرو یادی خوا ئەمە یەکێکە لە ماناکانی. وە هەندێك دەڵێن ئەم ئایەتە زەمی

گاورەكان دەكا كە یارمەتی (بەختە نەسریان) دابو بۆ خراپ كردنی (بیت المقدس)و هەندێك وتویانە ئەمە بۆ پێغەمبەرە كاتێكە لە حودەیبیە چوو بۆ عومرەو مەنعیان كرد لەراستیدا ئەمە بۆ ئەوانیشە بۆ هەر كەسێكە ڕێگری لە مزگەوتەكانی خوا بكات لە هەر سەردەمێكدا بێت، چونكە ئایەت ئەگەر هۆیەكیشی بوو بێت بۆدابەزینی بەو هۆیە تایبەت نابێت بەڵكو گشتیە تا قیامەت. خراپ كردنی مزگەوت دوو مانای هەیە یەكێكیان ئەوەیە بیروخێنیّو ئەوی تریان ئەوەیە كە نەهێڵرێت كە عیبادەتی تێدا بكرێت.

وەكو تەعمیر دوو مانای هەیە هەم ئاوەدان كردنەوەیەو هەم عیبادەت تێدا كردنی كەتەعمیری پیّ دەوترێت. دەبیّ دەسەڵاتداری موسڵمانان ئەوەندە بە هێز بێت ماوە نەدات كە ستەمكاران نزیكی مزگەوتەكان ببنەوە مەگەر لە كاتێكدا كە ئەوان گەردن كەچ بن بۆ موسڵمانان. ئەمەش پێی دەوترێت تۆڵە لە جۆری كردار (ا تزَاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل) چونكە كاتی خۆی ئەوان مزگەوتەكانیان مەنع دەكرد لە زیكری خوا، واتە: ئەمە ئەركێكی سەرشانی موسڵمانانە كە هەوڵ بدەن بۆ وەرگرتنەوەی مافی مزگەوتەكانو نەهێڵن ئەوان نزیكی مزگەوتەكان ببنەوە ئەمەش یەكێكە لە ماناكانی ئایەتەكە كە لە مانای ﴿ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ﴾ دایە.

(١١٥) ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا موڵكی خوایە ئەوسا ڕوو لە هەر كویّ دەكەن بیكەن خۆ خوای گەورە لەوێیە، بە ڕاستی خوا زانایيەكەی بەر بڵاوەو هەمو جێگایەك دەگرێتەوە چونكە ﷲ بەعیلمیو بەتوانایو بەزاتی گەمارۆی هەمو دروستكراوێكی خۆی داوە.

چەند تێبینیەك :

یەكەم- لەم ئایەتەوە دەردەكەوێت كە ئەگەر كەسێك نەیزانی قیبلە لە كام لایە دەتوانیّ نوێژەكەی بكات بەر هەر لایەك كە خۆی بە قیبلەی دەزانیّ، بەم شێوەیە ئەم ئایەتە ئایەتی قیبلە تایبەت دەكات هەر بۆیە زانایان پێیان وایە كە لە كاتی ترسی زۆرو لە كاتی جیهادو تێكەڵاو بوونی موسڵمانان لەگەڵ كافران دا لە شەڕ ئیتر بۆ نوێژ لەو كاتەدا قیبلە پێویست نیەو لە نوێژی سونەتیشدا لەسەر ولاخو سەیارە ڕوكردنە قیبلە پێویست ناكات.

دووهەم- پەیوەندی ئەم ئایەتە لەگەڵ ئایەتی پێشوودا، هەر خوا زانایە، بەڵام من بەم شێوەی بۆ دەچم كە زاڵم وستەمكاران هەر بەردەوامن لە دژایەتی ئاینی خوداو مزگەوتەكانیش یەكەم بنكەی ئەم ئاینە پیرۆزەیە، كەواتە نابێت چاوەڕوان بكرێت لەوان كە ئاوەدانیان بكەنەوە!! دەی ئیتر قەدەغە كردنی مزگەوتەكان لە مرۆڤی چاكو پاك تا حاكمیەتی خوا نەبێت بە شتێكی عەجایب نازانرێتو ئەو قەدەغە كردنە نابیّ ببێت بە هۆی سارد بونەوەی موسڵمانانو كەمتەر خەمیان سەبارەت بە ئەركەكانی سەرشانیانو تا بە دەست هێنانەوەی عیزەتو سەربەرزی خۆیان لە هیچ بەندایەتیەكی ڕاستو دروستو پاڵفتە كۆتایی نەكەنو بزانن بەرەو هەر كویّ ڕووبكەن خوا ئاگای لێیانەو خوا كرداری هیچ چاكەكارێك زایە ناكات، جا ئەگەر ئەو ستەمكارانە ئێوەیان قەدەغە كرد لە مزگەوتەكان ئێوە لە هەر كوێدا بن خوا ئاگای لێتانەو پێویستە سوور بن لەسەر بەندایەتی كردنیو هەوڵدان بۆ بن بڕ كردنی هەمو بەرپەرچەكان.

سێهەم- دیسان لەم ئایەتەوە وەردەگیرێت كە پێویستە مرۆڤ هەمیشە ڕوی لە خوا بێتو لەیادو باسی ئەو بیّ ئاگا نەبێت. ئینجا هەندیّ لە قسە ناپەسەندەكانی بیّ باوەڕانمان بۆ باس دەكاتودەفەرمویّ:

(١١٦) گاورو جوولەكەكان دەیان وت: خوا منالّی هەیە، پاكو بێگەردە خوا لەو كەم وكورتیانەی كە ئەوان پاڵی دەدەنە لای خوا بەڵكو بۆ خوایە موڵكێتی ئەوەی كەلە ئاسمانانو زەوی دایەو هەمویشیان گەردن كەچن بۆی. وە هیچیان لە دەستی دەرناچن. یەكەمیان دەی وت: عیسا كوڕی خوایە جوولەكەكانیش دەیان وت: عوزەیر كوڕی خوایە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویێت: {قَالَ اللَّهُ كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَزَعَمَ أَنِّي لَا أَقْدِرُ أَنْ أُعِيدَهُ كَمَا كَانَ وَأَمَّا شَتْمُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ لِي وَلَدٌ فَسُبْحَانِي أَنْ أَتَّخِذَ صَاحِبَةً أَوْ وَلَدًا/البخاري/ خوادەفەرمویّ: نەوەی ئادەم بە درۆم دەخاتەوە لەحاڵێدا كە ئەوە بۆ ئەو نەبوە، جنێوم دەداتیّ لەحاڵێدا كەئەوەیشی بۆنەبوە، جا بەدرۆ خستنەوەكەی بۆمن ئەوەیە كە ئەو واگومان دەكات كە من ناتوانم دووبارە زیندوی بكەمەوە وەك بوە، وەجنێوەكانیشی بۆمن ئەو قسەیەتی كە دەڵیّ من منالّم هەیە، سا پاكو بیّ نیازم لەوەی كە هاوسەر یان منالّم هەبێت }

(١١٧) ئەو خوایەی كە بە دیهێنەری ئاسمانو زەویە بەشێوەیەك كە وێنەی نەبوەو هێناویەتیە دی و هەر كاتێك ئیرادەی شتێك بكات و بیەویّ شتێك بكرێت ئەوسا هەر فەرمویّ: ببە بەكتوپڕی دەبێت؟، واتە: هیچ كارێك لە لای خوا گران نیە. وشەی (بدیع) بە دوو مانا بە كار دێت. مانایەكی زمانەوانی: بە مانای چاك كە لێرە ئەوە مەبەستەو مانایەكی شەرعی بە مانای داهاتوویەك كە وێنەی نەبو بێت.(بدیع) لە دیندا بە مانای یەكەم دەگونجیّ بە هەر ئیشێك لای كەسێك جوان بێت بوترێت بدیع، یان بیدعە بەم مانایە وتراوە بە جەماعەتی تەراویح بیدعەیە نەك بە مانای شەرعیەكەی چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ خۆی لە سەرەتایەوە

تەراویحی بە جەماعەت کردوە ، لە پاشان ترسی ئەوەی بووە کەوا فەرز بکرێ لە سەریان، جەماعەتەکەی تەرك کرد، دوای وەفاتی عومەر(خوالێی رازی بێ) وتی: حوکمی فەرز بون ئیتر تازە نەماوە با ئێمە جەماعەتەکە بکەین کەوا بو بیدعەی شەرعی نەبو بەڵکو بیدعەی زمانەوانی بو، ئینجا بە مانا شەرعیەکەی، واتە: داهێنانی شتێك کە ئەو شتە لە ئایینی خوادا نەبێتو ئەو شتەش پەیوەندی بە عەقیدەو عیبادەتەوە هەبێت ئەوە خراپەو پێغەمبەرمانﷺ لەم بارەوە دەفەرموێ: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمْرِنَا هَذَا مَا لَيْسَ فِيهِ فَهُوَ رَد / متفق عليه/ هەر کەسێك لەم دینەی ئێمەدا شتێك دابهێنێت کە لە دینەکەدا نەبێت ئەوە پەسەند نەکراووەردە} وە دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَد/ متفق عليه/ هەر کەسێك ئیشێك بکات کەبڕیاری ئێمەی لەسەر نەبێت بۆ کردنەکەی رەدەو لێی وەرناگیرێت}. ئەم فەرمودەیە زۆر وردە چونکە دەفەرموێ: ئەو شتەی کە بڕیاری ئێمەی لەسەر نەبێت، واتە: ئەگەر شتێکیش پێمان جوان بێت بەڵام بڕیاری کردنی لەسەر نەبێت نابێ بڵێین ئەمە شتێکی باشەو ئەگەر بکرێت چاکە، لە فەرمودەیەکی تردا دەفەرموێ: {إن أَصْدَقَ الحَدِيثِ كِتَابُ اللهِ وَأَحْسَنَ الهَدْيِ هَدْيُ مُحَمدٍ وَشَر الأُمور مُحْدَثَاتُهَا وَكُل مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُل بِدْعَةٍ ضَلَالَةٌ وَكُل ضَلَالَةٍ فِي النار/ النسائي وغ ە. صحه الالبا / باشترینو راسترین قسە قسەی خوایەو باشترینو چاکترین رەوشتو رێگا، رەوشتو رێگای پێغەمبەرە ﷺ وخراپترینی ئیشەکان ئەوەیە کە دادێتو هەمو شتێك کە دابێت بیدعەیەو هەمو داهاتویەکیش گومڕاهیە چونکە هەر شتێك دابێت لەم دینەدا مادام پێغەمبەر ﷺ نەیکردوە یان نەیفەرموە بیکەن دوو شتی زۆر پڕ مەترسی دەگەیەنێت

یەکەم: واتە : پێغەمبەر ﷺ نەیزانیوە چاکە یان زانیویەتیو بە ئێمەی نەوتوە واتە حەقی شاردوەتەوە کە ئەم دوو بەشە هەردووکیان زۆر پڕ مەترسین سەبارەت بە بیرو باوەڕی موسڵمانان چونکە پێغەمبەرمانﷺ یان بە نەزان دەزانن، یان بە شاردنەوەی راستی تاوانباری دەکەن، خوا پەنامان بدات لەم بۆچونە پڕ مەترسیە بۆیە دەفەرموێ: هەمو بیدعەیەك گومڕاهیەو هەمو گومڕاهیەکیش بۆ ناو ئاگری جەهەننەمە، بەڵام داهاتنی چاك لە ئیشەکانی دنیاییدا هیچ تاوانێکی تێدا نیەو فەرمودەی: {أَنْتُمْ أَعْلَمُ بِأَمرِ دُنْيَاكُمْ./مسلم وغ ە/ خۆتان چاکتر کاروباری دنیاتان دەزانن}

وەفەرموودەی: {الحَرْبُ خَدْعَةٌ/متفق عليه/ واتە شەڕ فێڵە} ئەم بەشەمان بۆ رون دەکاتەوە، جا پێویستە ئەم بەشە جیا کرێتەوە لە داهاتوە خراپەکانو نەدرێنە پاڵ یەك. بە راستی بەشی یەکەم سەرەرای ئەو دوو خەتەرە بەڵگەی ناتەواوی دینە چونکە ئەو شتە ئەکرێت ئەگەر بە ئایینی نازانی بۆچی دەیکەیت؟ وە ئەگەر بە ئایینی بزانیت، واتە: پێغەمبەر ﷺ ئاینی بە تەواوی نەزانیوەو ئیشی پێ نەکردوە کە ئەمەش دژی ئەم ئایەتەیە کە خوا دەفەرموێ:﴿ ئیمرۆ بۆ ئێوە دینم تەواو کردوە، تەواوم کرد نیعمەتی خۆم کەئیسلامە بۆتانو رازیم لێتان کە ئیسلام دینتان بێت﴾مائيده/٣ هەروەها بە پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێ:﴿ بڵێ: ئەگەر خواتان خۆش دەوێت دوای من بکەون خوداش ئێوەی خۆش دەوێو لەگوناهانتان خۆش دەبێ بەراستی خودا لێ بوردەیەو میهرەبانە﴾ئالی عيمران/٣١ ئیتر چۆن رێگەیەك هەڵدەبژێری کە ئەو نەیکردوە یان نەیفەرموە بیکەن؟!

بەراستی جێگای سەرسوڕمانە کە هەندێك دەڵێن پێغەمبەر ﷺ نەیپەرژاوە تا هەمو شتێك بڵێ چونکە هەر خەریکی جیهاد بووە بۆ دامەزراندنی حکومەتی ئیسلام بە راستی ئەم قسەیە زۆر قسەیەکی ناپەسەندو نارەوایە لە بەر ئەم دوو هۆیە:

یەکەم : مانای وایە پێغەمبەر ﷺ بە تەواوی ئاینی بە خەڵك نەگەیاندوە، دەی ئەگەر ئەو قسە راست بێت ـ پەنا دەگرم بە خوا لە بۆگەنی ئەو قسەیە۔ ئەبێ پێغەمبەر لە پێغەمبەرایەتی بشۆرێتەوە چونکە خوا دەفەرموێ:﴿ئەی پێغەمبەر ئەوەی کە لەلایەن پەروەردگارتەوە هاتوتە لات رایگەیەنە بە خەڵك ئەوسا ئەگەر ئەوەت نەکرد پەیامی ئەوت نەگەیاندوە﴾مائيده/ ٦٧ دووەم: وا دەردەکەوێت کە ئەمڕۆ هەمو شت تەواوەو خاوەنی حکومەتی خواو جەیشێکی زۆر بە هێزینو هیچ نەماوە بیکەن لە فەرزو لە سونەت بۆیە وا خەریکی ئەنجامدانی شتی زیادەین؟!! کابرا رۆژانە سێ جار ریشی سێ تێخە دەکاتەوەو دەیان فەرزو سەدان سوننەتی تەرك کردوەو فزەی لێوە نایەت، بەڵام بۆ ئەنجامدانی بیدعەو خەرافات بە ناو ئایینی خواوە وەك مەنجەڵی سەر ئاگر چەپۆکانیەتی؟! هەر کە بیستی وترا فلان شت بیدعەیەو تەرکی کەن وەك ئەوە یە کەدنیا روخا بێتو سورو کوڕ دەبێتەوەو ئیشی عومەرو عوسمان دەکات بە بەڵگە لەسەر دروست بوونی بیدعەو یان دەڵێ ئەوە نیە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {من سن سنه حسنه..} ئیتر نازانێ کە ئیشی خولەفای راشدین بیدعە نیەو پێویستە پەیرەویان بکەین بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ کە دەفەرموێ: {فَإنَّهُ مَنْ يَعِشْ مِنْكُمْ يَرَى اخْتِلَافًا كَثِيرًا وَإِيَاكُمْ وَمُحْدَثَاتِ الأُمورِ فَإنهَا ضَلَالَةٌ فَمَنْ أَدْرَكَ ذَلِكَ مِنْكُمْ فَعَلَيْهِ بِسُنتِي وَسُنةِ الخُلَفَاءِ الراشِدِينَ المَهْدِيينَ عَضوا عَلَيْهَا بِالنَوَاجِذِ/ الترمذي، صحه الالبا / بێگومان هەرکام لەئێوە بژیت نارێکییەکی زۆر دەبینێو کاروبارانێکی داهاتویش ئەوسا ئەوە گومڕاهیە جا هەرکام لەئێوە گەیشت بەوکاتە ئەوساپێویستە رەوشتی منو رەوشتی خەلیفە چاكو رێپێشاندەرەکان بگرێو بوەستن لە سەریانو دان بگرن بە

خۆتاندا} فەرمودەکەش دەفەرموێ: ﴿مَنْ سَن فِي الإِسْلَامِ سُنةً حَسَنةً...﴾ نافەرموێ: ﴿مَنْ سَنَّ بِدْعَةً حَسَنَةً﴾ ئەو فەرمودەیە سەبارەت بە کابرایەکی موسڵمان بو کە دوای ئەوە پێغەمبەر ﷺ داوای کرد یارمەتی برایەکی موسڵمانیان بدەن پێش هەمو کەسێك کیسەیەکی پڕ لە پارەی دانا ئینجا موسڵمانانی تر چاویان لەو کردو پارەیەکی زۆر کۆ کرایەوە بۆ ئەو موسڵمانەو پێغەمبەری ئازیز ﷺ زۆر دڵخۆش بوو ئەم فەرمودەیەی فەرمو{مَنْ سَن سُنةً حَسَنةً...} دەی ئەمە یەکەم، ئەمری پێغەمبەرە ﷺ لە کوێ بیدعەیە.

دووهەم، ئەوە چاکە کردن بوو کە دەیان ئایەت‌وسەدان فەرمودەی تری لەسەرە. دەی ئیتر کەی بیدعەی ئەنجام داوە ئەو کابرایە؟ چۆن دەیکەیت بە بیدعە کە قورئان ئەمری پێ دەکات‌و پێغەمبەر ﷺ داوای کردووە لە پێش چاوی دا ئەنجام دراوەو پەسەندی کردوە واتە هەم قەولەو هەم تەقریریشە. ئینجا خوای گەورە بت پەرستەکانی مەکە باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١١٨) ئەوانەی کە خاوەن کتێب نین، وتیان: دەی با خوا قسەمان لەگەڵدا بکات یان ئایەتێکمان بۆ بێنە لە لایەنی خواوە کە ئێمە بزانین تۆ ڕاست دەکەیت، ئەوانەی لە پێش ئەمانەوە بوون هەمان قسەیان دەکرد دڵەکانیان لە یەك دەچون بە ڕاستی ئێمە بەیانمان کردوە ئایەتەکانی خۆمان بۆ ئەو گەلەی کە یەقین‌و باوەڕی بە قیامەت‌و بە ڕاستی ئەم ئاینەی ئێمە هەیەو ئەوەندە بەڵگەشمان باس کردوە کە کەس بەهانەی نەماوە.ئەو موشریکانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا بون دەیان وت: ئێمە باوەڕ ناهێنین بە تۆ تا خوا خۆی قسەمان لەگەڵدا نەکات‌و پێمان بڵێت باوەڕ بهێنن ئەگینا ئێمە چۆن باوەڕ بکەین کە تۆ ڕاستدەکەیت؟ لەپێشدا بە موسایشیان دەوت: باوەڕت پێ ناهێنین تاکو خوا نەبینین بە چاوی خۆمان‌و ئەوانەی کە عیسایشیان دەپەرست پێیان دەوت: ئەگەر ڕاست دەکەی داوا بکە با لە ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بێت. پێغەمبەری خوا ﷺزۆر جار خەمی دەخوارد کە خەڵك باوەڕی پێ ناهێنن، زۆر جار قسەکانی کاری گەرنین لە خەڵکدا بەڵکو دژایەتیشیان دەکردوو ئازاریان دەدا خوای گەورە بەم شێوەیە دڵنەوایی دەکات‌و دەفەرموێ:

(١١٩) ئەی محمد بەڕاستی ئێمەتۆمان ناردوە کە مژدە دەری بەهەشت بیت بۆ ئەو کەسانەی کە چاکە دەکەن‌و ترسێنەری ئاگری دۆزەخ بیت بۆ ئەو کەسانەی کە خراپە دەکەن‌و تۆ هەرئەوەندەت لە سەرە. ئیتر کابرا بە کەیفی خۆیەتی باوەڕ دێنێت یان نایهێنێت‌و پرسیاری دۆزەخیانت لێ ناکرێت. ئینجا

وَلَن تَرْضَىٰ عَنكَ ٱلْيَهُودُ وَلَا ٱلنَّصَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۗ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَ ٱلَّذِى جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ ۙ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿١٢٠﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿١٢١﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتِىَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتُ عَلَيْكُمْ وَأَنِّى فَضَّلْتُكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٢﴾ وَٱتَّقُوا۟ يَوْمًا لَّا تَجْزِى نَفْسٌ عَن نَّفْسٍ شَيْـًٔا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنفَعُهَا شَفَٰعَةٌ وَلَا هُمْ يُنصَرُونَ ﴿١٢٣﴾ ۞ وَإِذِ ٱبْتَلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٍ فَأَتَمَّهُنَّ ۖ قَالَ إِنِّى جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا ۖ قَالَ وَمِن ذُرِّيَّتِى ۖ قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾ وَإِذْ جَعَلْنَا ٱلْبَيْتَ مَثَابَةً لِّلنَّاسِ وَأَمْنًا وَٱتَّخِذُوا۟ مِن مَّقَامِ إِبْرَٰهِـۧمَ مُصَلًّى ۖ وَعَهِدْنَآ إِلَىٰٓ إِبْرَٰهِـۧمَ وَإِسْمَٰعِيلَ أَن طَهِّرَا بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْعَٰكِفِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿١٢٥﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِـۧمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا بَلَدًا ءَامِنًا وَٱرْزُقْ أَهْلَهُۥ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ مَنْ ءَامَنَ مِنْهُم بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۖ قَالَ وَمَن كَفَرَ فَأُمَتِّعُهُۥ قَلِيلًا ثُمَّ أَضْطَرُّهُۥٓ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلنَّارِ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٢٦﴾

خوای زاناو خاوەن دەسەڵات پەردە لەسەر ڕووی جوولەکەو گاورەکان لادەدات‌و دەفەرموێ:

(١٢٠) نە جوولەکەو نە گاور هیچ کامێکیان لە تۆ ڕازی نابن هەتا تۆ دوای ئاینەکەی ئەوان نەکەوی، ئەی‌محمد ﷺ پێیان بڵێ بە ڕاستی ئەو ڕێنماییەی کە هاتوە لە لایەن خواوە کە قورئانە هەر ئەو ڕێپیشاندەرەو ڕاستەو ئەگەر تۆ پەیڕەوی لە ئارەزۆەکانی ئەوان بکەیت‌و بە کەیفی ئەوان ئیش بکەیت‌و بە مەیلی ئەوان بجولێیتەوە پاش ئەوەی کە حەق‌و زانین هاتە لات ئەوە ئیتر بزانە ئەی محمد ﷺ کە لە لایەنی خواوە نە دۆستایەتیەکت بۆ هەیەو نە یارمەتی دەرێك، بە ڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر گەورە بو بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئیتر چۆن ڕەوایە بۆ ئێمەی موسڵمان کە پەیڕەوی بکەین لەوانەی کە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: نەکەیت ئیشی وا بکەیت؟ بە داخەوە ئەمڕۆ گەلێ خەڵکی بە ناو موسڵمان وا دەزانن کە کافر فریایان دەکەوێت‌و یارمەتیان دەدات هەر لە بەر مرۆڤ دۆستی‌و هیچی تر؟! بەڕاستی پێویستە موسڵمانان لەو بۆ چوونە هەڵەیە تەوبە بکەن‌و دان بە هەڵەی خۆیان دا بنێن ئەگینا لە دین دەردەچن.

(١٢١) ئەو کەسانەی کە کتێبمان پێ داون بە ڕێك‌و پێکی دەیخوێننەوەو پەیڕەوی دەکەن، ئەوانە باوەڕیان بەو قورئانە هەیەو هەر کەسێکیش بێ باوەڕ بێت پێی بە ڕاستی ئەوانە ڕەنجەڕۆن.

(١٢٢) ئینجا الله جارێکی تر بانگی بەنی ئیسرائیلیەکان دەکاتەوەو بەم وشە جوانە: ئەی کوڕانی یەعقوب بیر بکەنەوە لەو هەمو نیعمەتانەی کە من دام بە ئێوەو ئێوەم بەرز کردەوە بە سەر هەمو خەڵکی سەردەمی خۆتان دا.

(١٢٣) بترسن لە ڕۆژێك کەهیچ نەفسێك سوود نادات بە نەفسێکی ترو هیچ یارمەتیو پارەو پولێکی لێ وەرناگیرێتو شەفاعەتیش سوودی پێ ناداتو ئەوان یارمەتی نادرێن چونکە کەسێك باوەڕی ڕاستەقینەی نەبێت شەفاعەتی کەس نایگرێتەوە، ئەمە بە مانای نەبونی شەفاعەت نیە بەڵکو شەفاعەتی پێغەمبەرو شەهیدانو پیاو چاکانو زانایانی باش لە پاش ئیزنی خوا هەیە، بەڵام ئەو شەفاعەتە ئەو کەسانە ناگرێتەوە.ئینجا دوا بە دوای ئەمانە باسی ئیبراهیممان عليه السلام بۆ دەکات چونکە ئەمانە زۆر خۆیان هەڵدەنا بە ئیبراهیمەوە عليه السلام جووەکان دەیان وت: ئیبراهیم عليه السلام لە ئێمەیەو گاورەکانیش دەیان وت: لە ئێمەیەو مووشریکەکانیش دەیان وت: لە ئێمەیە، خوای گەورە بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ:

(١٢٤) بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە خوا ئیبراهیمی تاقی کردوە بە چەند وشەیەك جا ئەویش ئەو وشانەی تەواو کرد، ئینجا خوا فەرمووی: بەبێگومان من تۆ دەکەم بە پێشەوای خەڵك. ئیبراهیم عليه السلام وتی: ئەم بڕیارە بۆ نەوەکانیشمە خوا فەرمووی: ئەم پێشەوایەتیەی خۆم نادەم بە ستەمکاران. واتە: زاڵم نابێت ببێت بە پێشەوا وەك وتراوە(إن الإمامةَ لا تَنعقِدُ لِكافرٍ بَل وَلا لِفاسِقٍ أو ظالِمٍ ابتداءً/. بەراستی پێشەوایەتی هەر لەسەرەتاوە دانامەزرێت بۆکافر بەڵکو بۆ فاسق یان بۆ ستەمکاریش) بەڵام ئەگەر هاتو زاڵمێك حوکمی گرتە دەستو بە پێی شەرع حوکمی دەکردو یاسایەکی تری بۆ حکومەتداری دانەنا جا ئەگەر توانرا لەسەر حوکم لابرێت بە بێ ئەوەی کە فیتنەیەکی گەورەتر روبدات ئەو لادەبرێت بەڵام ئەگەر وانە بو پێویستە خۆگری بکرێت لەسەر زوڵمەکەیو بەحاکمیش بناسرێتو لەو بڕیارانەی کە بەپێچەوانەی شەرع نین گوێڕایەڵی بکرێت بەڵام ئەگەر بڕیارێکی زاڵمانە یان ناشەرعی بدات لەو بڕیارە بەگوێی ناکرێت وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {لا طاعَةَ فِي مَعْصِيَةٍ إنمَا الطاعَةُ فِي المَعْرُوفِ/متفق عليه/ گوێڕایەڵی نییە بۆ هیچ مەخلوقێك لەو شتانەی کە تاوانەو پێچەوانەی بڕیاری الله - یە بەڵکو گوێڕایەڵی هەر لە چاکە دایە} بەڵام ئەگەر هاتو توشی کوفر بو لە بازنەی باوەڕداری دەرچو پێویستە لەسەر موسڵمانان کە لەسەر حوکم لای ببەنو حاکمێکی شەرعی بۆخۆیان دانێن هەروەك عوبادەی کوڕی سامت دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ بانگی کردینو پەیمانی لێوەرگرتین کە لەوانە: {وَأنْ لا نُنازِعَ الأمرَ أهْلَهُ إلا أنْ تَرَوْا كُفْرًا بَوَاحًا عِنْدَكُمْ مِنَ اللهِ فِيهِ بُرْهَانٌ/متفق عليه/ دژی دەسەڵاتداران نەوەستین مەگەر کوفرێکی وا ئاشکرایان لێ ببینن کە بەڵگەی ڕۆشنتان لە لایەن خوای گەورەوە لەسەر ئەو کوفرە هەبێت} مەبەست بە عەهد لەم ئایەتەدا پێشەوایەتیە. وە هەروەك لەم ئایەتەدا ئاماژەی پێکرا زوڵمو نەمانی دادپەروەری دەبێتە هۆی لە ناوچونی دەسەڵاتو گەورەییو ڕێز هەربۆیە وتراوە: (إنّ الله يُقيمُ الدولةَ العادِلةَ وإن كانَتْ كافِرة، ولا يقيمُ الظالِمَةَ وإنْ كانَتْ مُسلِمةً / واتە دەوڵەتێك کە دادپەروەر بێت الله بەردەوامی دەکات ئەگەرچی کافریش بێت بەڵام دەوڵەتێك کە زاڵم بێت بەردەوامی ناکات ئەگەرچی موسڵمانیش بێت) وەلە نیشانەکانی حاکمی موسڵمانی دادپەروەر ئەمانەتداریو دەست پاکیە لەو ماڵەی کە لەژێر دەستی دایە پێغەمبەرمان دەفەرموێ: {لَا يَحِلُ لِلْخَلِيفَةِ مِنْ مَالِ اللهِ إلا قَصْعَتَانِ قَصْعَةٌ يَأكُلُهَا هُوَ وَأَهْلُهُ وَقَصْعَةٌ يَضَعُهَا بَيْنَ يَدَيْ النَّاسِ/ أ د، صححه الالبا / حەڵاڵ نیە بۆ خەلیفە لەماڵی گشتی (بيت المال) لە خۆراکدا جگە لە دوودەفر نەبێت کە یەکێکیان بۆ خۆیو خاوخێزانی وئەویتریان بۆ مێوانو دەوروبەرانی}

(١٢٥) بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە بەیتمان وا خۆشەویست کرد کە خەڵك هەردەم بگەڕێنەوە بۆ لایو دنیاو دوا ڕۆژیان لەو جێگایەدا دەست کەوێتو کردمان بە جێگای ئەمنو ئاسایش کە کەس نەتوانێت لەو جێگایە دا دەست درێژی بکات تەنانەت بۆ سەر حەیواناتیش دە ئێوەش جێگای ئیبراهیم عليه السلام بکەن بە جێگای نوێژ بۆ خۆتان. ئەمە ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە ڕێزو گەورەیی ئەو بەیتە لە بەر خوای بەیتە نەك بچین دارو بەرد بپەرستین واتە ئاگاتان لە خۆتان بێتو بزانن کەچی دەکەنو خۆتان نەکەن بە موشریك، بەڵکو ئێوە لەو شوێنەدا عیبادەتی خوا بکەن، هاتنی ئەم ئایەتە یەکێکە لە دووپات کردنەوەی قورئان بە بۆ چونی عومەر رضي الله عنه دەڵێن: کاتێ کە چوونە مەکەو مەقامی ئیبراهیمی عليه السلام ی دی عومەر وتی: خۆزگە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم شوێنەی بکردایە بە شوێنی نوێژ جا ئەوەبو کەئەم ئایەتە دابەزی. ئیمامی عومەر رضي الله عنه وتویەتی: {وَافَقْتُ رَبِي فِي ثَلاثٍ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ الله لَوْ اتَخَذْنَا مِنْ مَقَامِ إبْرَاهِيمَ مُصَلّى فَنَزَلَتْ وَاتخِذُوا مِنْ مَقَامِ إبْرَاهِيمَ مُصَلّى وَآيَةُ الحِجَابِ قُلْتُ يَا رَسُولَ الله لَوْ أَمَرْتَ نِسَاءَكَ أنْ يَحْتَجِبْنَ فَإنَهُ يُكَلِمُهُنَ البَرُ وَالفَاجِرُ فَنَزَلَتْ آيَةُ الحِجَابِ وَاجْتَمَعَ نِسَاءُ النبِي ﷺ فِي الغَيْرَةِ عَلَيْهِ فَقُلْتُ لَهُنَ عَسَى رَبُهُ إنْ طَلقَكُنَ أنْ يُبَدِلَهُ أزْوَاجًا خَيْرًا مِنْكُنَ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ... لەسێ شتدا بڕیارم وەك بڕیاری پەروەردگارم دەرچو:

یەکەم - ئەوە بو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە ئەم جێگای ئیبراهیممان عليه السلام بکردایە بە نوێژگە جا ئەم ئایەتە ﴿

﴿ وَإِذۡ جَعَلۡنَا ٱلۡبَيۡتَ مَثَابَةٗ لِّلنَّاسِ وَأَمۡنٗا وَٱتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبۡرَٰهِـۧمَ مُصَلّٗىۖ ... ﴾ ی البقرە:١٢٥ دابەزی.

**دووهەم** ـ ئایەتی حیجاب کە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ خۆزگە فەرمانت بکردایە بە خێزانەکانت بەپەردەکردن چونکە بەراستی هەمومرۆڤێکی چاكو خراپ قسەیان لەگەڵ دەکات، جائایەتی پەردە دابەزی.

**سێهەم** ـ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان یەك دەنگ بون لەبارەی تەنگی ژیانیانەوە لەسەر ئەو خۆشەویستە ﷺ جا منیش پێم وتن: ئەگەر تەڵاقتان بدات زۆر نزیکە پەروەردگاری بۆی بگۆڕێتەوەبە هاوسەرانێکی چاکتر لەئێوە جائەم ئایەتەی پێنجەمی تەحریم دابەزی} بۆچی ئەم خوا ناسە بەرێزە وای گووت؟ بۆیە وای وت: تا وا نەزانرێت کە ئیبراهیم عليه السلام خۆی توانیویەتی بەو پێ نەرمەی کارلەوبەردە رەقە بکاتو ببن بە موشریك هەر وەك چۆن ئەو درەختەی برِی کە پێغەمبەر ﷺو یارەکانی لە ژێریا پەیمانیان بەستبو بۆ جیهاد کردن لە رێگای خودا کە دی خەڵك کەم کەم بۆ لای دەچن‌و بە درەختێکی پیرۆزی دەزانن کە ئەمەش دەرسێکی زۆر گرنگە بۆ ئێمەی موسڵمان‌و پێویستە خۆمان لەو دارو بەردو بنچکانە دوور بخەینەوە کە خەڵکی نەزان بە شتێکی بە بەرەکەتو پیرۆزیان دەزانن چونکە جێگای هیچ کەس لە جێگای پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی کە عومەر خۆی یەکێك بوە لەوانەچاکترو پیرۆزتر نیە.

ئینجا خوا سەبارەت بە ئیبراهیم عليه السلام دەفەرموێ: ئەمرمان کرد یان وەحی مان کرد بۆ لای ئیبراهیم‌و ئیسماعیل کە ماڵەکەمان پاك بکەنەوە بۆ ئەو کەسانەی کە تەواف دەکەن‌و ئەوانەی کە لەوێدا نیشتە جێن و ئەوانەی کە عیبادەت دەکەن بۆ خواو نوێژ دەکەن یان گەردن کەچن‌و سوجدە دەبەن بۆ خوا، لەو کاتەدا ئاوەها فەرمانێکی پەروەردگار دەرچووە ئێستاش هەتا کەعبە دەمێنێت هەر ئاوەهایە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەی قورەیش ئێوە رێگری لەهیچ کەسێك نەکەن نە بە شەو نە بە رۆژ کە تەوافی ئەم کەعبەیە بکات، هەمو کەس ئازادە لەو جێگایەدا عیبادەتی خوا بکات لە هەمو کاتێکدا.

(١٢٦) بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە ئیبراهیم عليه السلام‌وتی: خوایە ئەم شارە بکەیت بە شارێکی ئەمین کە کەس نەتوانێ دەست درێژی بکاتە سەرو لە بەروبوومەکان رۆزی خەڵکەکەی بدە، ئەوەی کە باوەڕی هێناوە لەوان بە خواو بە رۆژی قیامەت، خوای گەورەش فەرموی: ئەوەی کە کافریش بێت ئەوسا من کەمێك رۆزی پێدەدەم‌و دەیژێنم، لە پاشان ناچاری دەکەم بەچونە ناو سزای ئاگرەوە کە پیسترین جێگایە ئەوئاگرە. بیر کەنەوە لەو کاتەی کە

وَإِذۡ يَرۡفَعُ إِبۡرَٰهِـۧمُ ٱلۡقَوَاعِدَ مِنَ ٱلۡبَيۡتِ وَإِسۡمَٰعِيلُ رَبَّنَا تَقَبَّلۡ مِنَّآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٢٧﴾ رَبَّنَا وَٱجۡعَلۡنَا مُسۡلِمَيۡنِ لَكَ وَمِن ذُرِّيَّتِنَآ أُمَّةٗ مُّسۡلِمَةٗ لَّكَ وَأَرِنَا مَنَاسِكَنَا وَتُبۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٨﴾ رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُزَكِّيهِمۡۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٢٩﴾ وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصۡطَفَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٣﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٤﴾

ئیبراهیم عليه السلام ئاوا داوایەکی کردوەو داواکەشی وەرگیراوە، جا تەماشای ئەدەبی پێغەمبەران بکە لە بەرامبەر خودا ﷻ لەداوای ئێرەیدا وتی:﴿ مَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُم ﴾ بەڵام لە پێشەوە وتی ﴿ وَمِن ذُرِّيَّتِي ﴾ بۆ؟ چونکە لەوەڵامی پێشویدا خوای گەورە فەرموی: ﴿پێشەوایەتی من نادرێت بەستەمکاران﴾ واتە: ئەو داخوازیەت بەگشتی لێ وەرناگیرێت ئیتر ئیبراهیم عليه السلام لێرەدا شەرمی کرد داوای رۆزی بۆ هەمویان بکاتو وتی:﴿ئەوکەسەی کەباوەڕی هێناوە﴾ بەڵام خوای گەورە دەفەرموێ: مەسەلەی ژیان جیایە ـ ئەی ئیبراهیم ـ من رەحمانم ودروستکراوانی خۆم دەژێنم باکافریش بێت چونکە هەرمنم خالیق‌و رازق‌و ژیانی دنیا ژیانێکی کەمەو پەیوەندی بە تاکەوە هەیە، بەڵام مەسەلەی رەهبەری‌و ئیمامەت پەیوەندی بە خەڵکەوە هەیەو دەبێ ستەمکار نەبێت‌و مافی خەڵك پێشێل نەکات.

(١٢٧) جابیر کەرەوە لەو کاتەی کە ئیبراهیم عليه السلام بناغەی بەیتی بەرز کردوەو ئیسماعیلیش عليه السلام، جا لەو کاتەدا وتیان: ئەی پەروەردگارمان لێمان وەرگرە بە راستی تۆ بیسەرو زانەری.

ئەم ماڵە لە کۆنەوە دروستکراوە، بەڵام رووخاوەو ئیبراهیم عليه السلام بە یاریدەری ئیسماعیلی کوڕی عليه السلام لەسەر ئەو بناغە کۆنەی دروستی کردۆتەوە ریوایەت هەیە کەوا دەگەیەنێت کە هەر لە زەمانی ئادەم عليه السلام دا دروست بوە، بەڵام لە دواییدا رووخاوە لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کاتێ کە ئیبراهیم عليه السلام ویستی

ئەو ماڵە دروست بکات کەمێك بەرزایی هەبو ئا لەو بەرزاییەدا ئەو ماڵەی دروستکرد. ئەم دوو پێغەمبەرە (علیهما السلام) وا خەریکن ماڵێك دروست دەکەن بۆ ﷲ خۆی، جالە خۆیان بایی نابن‌و داوایان دەکرد کە خوا لێیان وەرگرێت. واتە: کاتێ کە تۆ عیبادەت دەکەی پێویستە بپارێیتەوە کە لێت وەرگرێت نەك لە خۆت بایی ببی ئەوەتە پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە پاش زۆربەی نوێژەکانی دەیفەرمو: (أستغفر ا / خوایە داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم) ئاوایە خوا ناسینی راستەقینەو بەندایەتی بێ غەل‌و غەش نەك وەك ئێمە کە دوو رکات نوێژی بێ سەرو بەر دەکەین‌و خۆمان هەڵدەکێشین‌و منەت بە سەر خودادا دەکەین وەك ئەوە کە ﷲ موحتاجی ئێمە بێت لەکاتێکدا کە ئەولە هەمو عالەم بێ‌نیازە. ئیبراهیم ﷺ درێژە بە دوعاکەی دەدات‌و دەڵێ:

(١٢٨) پەروەردگارمان بمانگێرە بە مل کەچ‌و گوێڕایەڵی فەرمانەکانت‌و بمانکە بە دوو موسڵمانی چاك وپاك‌و وامان لێ بکە کە تەنها بۆ تۆ گەردن کەچ بکەین، لە نەوەی ئێمەش گەلێکی موسڵمان سەوز بکەو شێوەو جێگای عیبادەتمان پێ پیشان بدە کە چۆن عیبادەتت بکەین‌و تەوبەمان لێ وەرگرە بە راستی ئەی خوایە تۆ زۆر تەوبە وەرگری‌و زۆر بە رەحمی.

بەڵێ لە خوا ترسان ئاوایەو پێویستە هەرچەند عیبادەتت هەبێ هەر لە خوا زیاتربترسیت، چونکە ﷲ خاوەنی هێزەو نیازی بە بەندایەتی ئێمە نیەو لە بەندایەتی ئێمەدا سوودێك بەو زاتە ناگات بۆیە پێغەمبەرمانﷺ زۆر جار دەیفەرمو{يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ /رواه الترمذی. صححه الالبا / ئەی کەسێك کەوا دڵەکان دەگۆڕی، دڵم دامەزرێنە لە سەردینی خۆت}

ئەوەتا ئیبراهیم‌و ئیسماعیل دوو پێغەمبەری خوداو خەریکی عیبادەتن کەچی زۆر بە پەرۆشەوە دەڵێن: دەوامامان بدە لەسەر ئەم دینە، هەر لەسەر ئەو بناغەیە کەپێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: من رۆژانە سەد جار دەگەڕێمەوە بۆ لای خواو تەوبە دەکەم، دەی موسڵمانان تەوبە بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، چونکە بە تەوبە کردنی راست خوا هەمو گوناهەکان دەسرێتەوە.

(١٢٩) ئەی خوایە لە ناویاندا پێغەمبەرێك لە خۆیان بنێرە بۆیان کە ئایەتەکانی تۆ بخوێنێتەوە بە سەریانداو فێری کتێب‌و داناییان بکات‌و پاکیان بکاتەوە، بە راستی خوایە تۆ خاوەنی دەسەڵاتی‌و هەمو ئیشەکانت بە حیکمەتە.

بەڵێ ئەم دوعایەش وەرگیرا، خوا ئەم پێغەمبەرە بەرێزەی بۆ ناردین وەك خۆی فەرمویەتی: من بەری ئەو دوعایەم. وە ئەو قورئانە پڕ خێرو بەرەکەتەی بۆ ئێمە هانی کە پەیڕەوانی سەربەرزو سەرفەرازی هەردوو دنیان. سوپاس بۆ خواو درودو رەحمەتی خوا لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەرمان‌وتەواوی پێغەمبەرانی تر بێت. ئینجا دەفەرموێ:

(١٣٠) کێ هەیە کە پشت بکاتە ئاینی ئیبراهیمﷺ کە ئاینی پێغەمبەرمانە بێجگە لەو کەسەی کە خۆی نەفام بکات؟! ئێمە لە دنیادا ئەومان هەڵبژاردو لە رۆژی قیامەتیشدا لە ریزی پیاو چاکانە. واتە: پەیڕەوی لە ئایینی ئیبراهیم ﷺ پێویستە لەسەر ئەم ئوممەتەی پێغەمبەر ﷺ چونکە ئەم ئاینە ئاینی ئیبراهیمە بە زیادەیشەوە.

(١٣١) بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە پەروەردگاری پێی فەرمو: گەردن کەچ‌و گوێ رایەڵ بە بۆمان‌و بە چاکی فەرمانەکانمان جێ بەجێ بکە. ئەویش لەوەڵامدا وتی: من گەردن کەچم بۆ پەروەردگاری جیهان.

(١٣٢) ئا بەو وشە جوانانە ئیبراهیم ﷺوەسیەتی کرد بۆ کوڕەکانی‌و یەعقوبیشﷺ کە وتی: ئەی کوڕانی خۆم بە راستی‌و دروستی خوای گەورە هەڵی بژاردووە بۆ ئێوە ئەم بەرنامەیە ئەوسا نەمرن مەگەر ئێوە موسڵمان بن. ئاشکرایە کە هیچ کەس نازانێت خۆی کەی دەمرێت، مرۆڤ هەر سات ئیحتیمالی مەرگی هەیە کە واتە دەبێ یەك سات لەخوا بێ ئاگا نەبن نەوەك لەو کاتەدا بمرن‌و بە ناموسڵمانی لەم دنیایەدا برۆن.

(١٣٣) ئایا ئێوە لەوێ بوون کاتێك کە یەعقوب ﷺ گەیشتە سەرە مەرگ کە ئەو کاتە بە کوڕەکانی وت: چی دەپەرستن پاش من؟ ئەوەیە باوکی دڵسۆز کە نزیکی گیان دەرچونیەتی وا لە غەمی کوڕەکانی پێیان دەڵێت: ئێوە لە پاش من چی دەپەرستن؟ ئەوانیش وتیان: خواکەی تۆ دەپەرستین‌و خوای باوکانت ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و ئیسحاق کە یەك خوایەو ئێمە گەردن کەچین بۆ ئەو خوایە.

لەم ئایەتەوە دەرکەوت کە وشەی ئیسلام لە دێرینەوە لە سەردەمی ئیبراهیمەوەﷺ هاتوە هەروەك ئاخر ئایەتی سورەتی حەج دەفەرموێ: ﴿ ئەو لە پێشدا ناوی ناون موسڵمان﴾

وشەی ( أَمْ ) بۆ بادانەوەیەبۆ سەرقسەی پێشو یان بۆ گواستنەوەیە واتە قسەی پێشو وازلێ بهێنەو وەرەبۆ ئەم قسەوباسەی تر.

(١٣٤) جا لە پاش ئەوەی کە باسی ئیبراهیم‌و ئیسماعیلی کرد بۆ بەنی ئیسرائیل کە ئەوان بە باوەگەورەی خۆیانیان دەزانن‌و هەر کام لە جوولەکەو گاور دەیان وت: باوکی ئێمەیەو زۆر بەوەدا دەنازین قورئان هاتوو پەیوەندی خزمایەتی هەڵوەشاندەوە ئەگەر لە بیرو باوەڕدا یەك نەبن‌و گەردن کەچی ئاینی خوا نەبن

وەك دەفەرموێ: ئەوانە گەلو نەتەوەیەك بون لەپێش ئێوە داو رۆیشتن، جا هەربۆ خۆیانە ئەوەی كە كردویانەو تۆڵەی خراپەو پاداشی چاكەیان هەر لەسەر خۆیانەو بۆ خۆیانەو ئێوە بەر پرسیارنین سەبارەت بەوان، واتە بە بۆنەی خزمایەتیو قەومایەتی لەگەڵ ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوب دا سوودێكتان پێ ناگات، ئەگەر خۆتان چاك نەبنو ئیشی باش نەكەن، وەپرسیار ناكرێت لە ئێوە لەئەوەی كە ئەوان كردویانە. ئەوان هەرچیان كردوە بۆ خۆیانەو ئێوەش هەرچی دەكەن بۆ خۆتانە. ئینجا دێتە سەر باسی قسەی ئەو جوولەكەو گاورانەو دەفەرموێ:

(١٣٥) ئەیان وت: ببن بە جوولەكەو بە گاور دەكەوونە سەر رێگای راست ودروست. جالێرەدا قسەكانیان كۆ كراوەتەوە ئەگینا ئەوانیش هەر یەكەیان هەرخۆی بە راست دەزانێ وەك لە پێشەوە زانیمانو هەر یەكەیان موسڵمانەكانیان بۆ لای خۆیان بانگ دەكرد. جوولەكە دەیان وت: ببن بە جوولەكە و گاورەكانیش دەیان وت: ببن بە گاور، خوای گەورەیش دەمكوتیان دەكاتو دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ بڵێ: نەخێر وا نیە كە ئێوە دەڵێن ئێمە دوای ئاینی راستو دروستی ئیبراهیم ﵇دەكەوین، خۆ ئیبراهیم ﵇لە موشریكان نەبوە كە بابای موشریك خۆی هەڵدەنێتو دەڵێ ئیبراهیم ﵇لە ئێمەیە. جا خوا دەفەرموێ:

(١٣٦)بڵێن: ئێمە باوەڕمان هێناوە بە خواو بەوەی كە رەوانە كراوەتە لامانو ئەوەی كە رەوانە كراوەتە لای ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوبو (**أسباط**) بەوەیش كە دراوە بە موساو عیساو ئەوەی كە دراوە بە تەواوی پێغەمبەران لە لایەنی خوای خۆیانەوە كە ئێمە هیچ جیاوازیەك دروست ناكەین لە نێوان ئەو پێغەمبەرانەداو هەمویان وەك یەك بە راست دەزانین(سەلامی خوا لەهەمویان بێ)و پەیامی هەمویان بە حەق دەزانین لە كاتی خۆیاندا و ئێمە تەنها بۆ خوا گەردن كەچینو بەندەو گوێ ڕایەڵی ئەوین.

(**الأسباط**) واتە: نەوەكانی یەعقوب كە بەرەی دوازدە كوڕی ئەو بوونو هەریەكەیان بەرنامەیان بۆ هاتووە ئێمە بەراستیان دەزانینو باوەڕمان پێیان هەیە.

ئێستا پێویستە هەمومان دوای محمدﷺ بكەوین چونكە ئایینەكانی تر بۆ كاتو گەلێكی تایبەت بوونو هەر بۆیەش خوا زەمانەتی نەگۆڕانی نەكردونو دەستكاری كراونو گۆڕاون. بەڵام ئەم قورئانەی پاراستوەو دەیپارێزێت هەتا ئەورۆژەی كەدەیباتەوە وەك فەرمویەتی: ﴿بەبێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ناردوەو چاودێریشی دەكەین﴾ حیجر/٩

وَقَالُواْ كُونُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰ تَهۡتَدُواْۗ قُلۡ بَلۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِـۧمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٣٥﴾ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿١٣٦﴾ فَإِنۡ ءَامَنُواْ بِمِثۡلِ مَآ ءَامَنتُم بِهِۦ فَقَدِ ٱهۡتَدَواْۖ وَّإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا هُمۡ فِي شِقَاقٖۖ فَسَيَكۡفِيكَهُمُ ٱللَّهُۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾ صِبۡغَةَ ٱللَّهِ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ صِبۡغَةٗۖ وَنَحۡنُ لَهُۥ عَٰبِدُونَ ﴿١٣٨﴾ قُلۡ أَتُحَآجُّونَنَا فِي ٱللَّهِ وَهُوَ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡ وَلَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُخۡلِصُونَ ﴿١٣٩﴾ أَمۡ تَقُولُونَ إِنَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطَ كَانُواْ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ قُلۡ ءَأَنتُمۡ أَعۡلَمُ أَمِ ٱللَّهُۗ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن كَتَمَ شَهَٰدَةً عِندَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٤٠﴾ تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤١﴾

ئەبوهورەیرە دەڵێت: {**كَانَ أَهْلُ الْكِتَابِ يَقْرَءُونَ التَّوْرَاةَ بِالْعِبْرَانِيَّةِ وَيُفَسِّرُونَهَا بِالْعَرَبِيَّةِ لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَا تُصَدِّقُوا أَهْلَ الْكِتَابِ وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ** ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا ...**الآية** ﴾ /البخاري/ ئەهلی كتێب تەوراتیان بەعیبرانی دەخوێندەوەو دەیانكردەوە بە عەرەبی بۆ خەڵكی موسڵمان، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نەباوەڕ بكەن بەئەهلی كتێبو نە بە درۆیان بخەنەوەو بڵێن: باوەڕمان هێناوە بەخواو بەوەی كە رەوانە كراوە بۆ لامان... ئەو ئایەتە بەتەواوی}.

(١٣٧)ئەگەر ئەوان باوەڕیان هێنا وەكو ئێوە باوەڕتان هێناوە ئەوە ئەوانیش رێگای هیدایەتیان دۆزیوەتەوەو برای یەكترن خۆ ئەگەر پشتیشیان هەڵچەرخاند، ئەوسا ئیتر ئەمانە كەوتونەتە ناو بەدبەختیو بەشبەشیو لە یەك خوێندنو لە یەك كوشتنەوەو هەمیشە هەر خەریكی ئاژاوەو ئاگری شەڕ هەڵكردنن، ئینجا خوای خاوەن دەسەڵات دڵخۆشی پێغەمبەرمانﷺ دەكاتو دڵی دەداتەوەو دەفەرموێ: ئەمانە ئەگەر هەر دژایەتیت بكەن خوا بۆ تۆ بەسەو پارێزگاریت دەكاتو دوژمنانت زەلیلو سەر شۆڕ دەكاتو بە راستی ئەو بیسەرو زانەرە.

(١٣٨)رێبازەكەی خوا بگرنو بەم لاو بەم لادا مەڕۆنو دڵخۆش بن بەو ئایینە چونكە بەرنامەی خوایەو كێ هەیە لە خوا جوانتر بەرنامە دابنێت؟ ئێمە هەربۆ ئەو بەندایەتی دەكەین، جا هەر

كەسێك بەندایەتی‌و گەردن كەچی كرد بۆ كەسێك جگە لە خوا ئەوا لەو ڕێبازە دەرچووە. وشەی ﴿ صِبْغَةَ ﴾ واتە ڕەنگ، مەبەست ئاینی خوایە.

(١٣٩) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ ئێوە دەمبازی دەكەن لەگەڵ ئێمەدا لە بارەی خواوە، ئێمە دەڵێین خوا بپەرستن، ئێوە دژایەتی خوا دەكەن؟ لەحاڵێكدا كە هەر ئەوە پەروەردگاری ئێمەو پەروەردگاری ئێوەش‌و كرداری چاكی ئێمە هەر بۆ خۆمانەو كرداری خۆتان بۆ خۆتانەو ئێمە تەنها بۆ ئەو خۆمان یەكلا دەكەینەوە. پاشان بە هێنانی (أم) باسەكە دەگوازێتەوە بۆ باسێكی ترو دەفەرموێ:

(١٤٠) ئایا ئێوە دەڵێن ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و اسحاق‌و یەعقوب‌و ئەسبات جوولەكە یان گاور بوون؟ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە زاناترن یان خوا بەراستی ئەوان نە جوولەكەو نە گاورو نە موشریك بوون، بەڵكو ئەوانە پێغەمبەرانی ڕاستەقینەی خوا بوون‌و خۆیشیان دەیانزانی وایە، بەڵام دەیان شاردەوە بۆیە خوا دەفەرموێ: كێ هەیە زاڵم تر لەو كەسەی كە شایەتیەكی لا بێ‌و لە خوای بیشارێتەوە ؟ با چاك بزانێت كە ستەمێكی گەورەی لە خۆی‌و لە خەڵكیش كردوە، چونكە خوا ئاگای لێیەتی وەك دەفەرموێ: خوا بێ ئاگا نیە لەوەی كە ئێوە دەیكەن. بەراستی ئەوە هەڕەشەیەكی توندی خوایەو بزانن كە هەمو كەس بەتۆڵەی خۆی دەگات. ئینجا دەقی ئایەتی پێشووتری دووبارە كردەوەو دەفەرموێ:

(١٤١) ئەوە ئوممەتێك بون هەرچیان كردوە بۆ خۆیانەو ئێوەش هەرچیتان كردوە بۆ خۆتانەو پرسیار ناكرێت لە ئێوە لەو ئیشەی كە ئەوان كردویانە. جا پێویستە ئێمەیش وەك موسڵمان بیر بكەینەوەو زەمانمان لە بەرامبەر پێشینە چاكەكانی خۆمانەوە پاك بێ‌و بێجگە لە دوعای خەیر شتێكی تریان پێ نەڵێین، مادام پرسیاری كردارەكانی ئەوان لە ئێمە ناكرێت ئیتر ئێمە بۆ خۆمان تاوانبار بكەین بە غەیبەت كردنیان؟!

لەم ئایەتەدا فەرموی پرسیاری ئەوان لە ئێوە ناكرێت ئەمە وا دەگەیەنێ كە پرسیاری ئێمە لەوان مومكینە، بەڵێ لە ڕاستیدا وایە خراپەو تاوان‌و چاكەی پێشوان بۆ خۆیانەو ئێمە لەو بارەوە تاوانێكمان نیە تا پرسیارمان لێ بكەن بەڵام ئەگەر پێشوان هەوڵی گەڕانەوەی خراپەیەكیان دا بێ یان بیدعەتێكیان دروست كردبێت‌و خەڵكی پاش ئەوان پەیڕەوی كردبن خوای گەورە، بێجگە لە پرسیاری خۆیان پرسیاری سەر لێشێواندنی خەڵكی پاش خۆیشیان لێ دەكات. بۆ نموونە: ئیسلام هات ئافرەتی لە ڕوتی‌و بەرەڵایی ڕزگار كردو بەرگی شەرەف‌و كەرامەتی كردە بەری‌و چەندین چەرخ بەم شێوەیە تێ پەڕی لە پاشدا بەشێك لە ئافرەتان شەیتان فریوی دان‌و دووبارە خۆیان ڕوت كردەوە، جا ئەمە كام ئافرەت لە پێشەوە ئەم ڕەوشتە نا پەسەندەی زیندو كردوەتەوە تا قیامەت هەر ئافرەتێك بەم شێوەیە ڕەفتار بكات چەند گوناهی دەگات ئەو ئافرەتەی پێشوو ئەوەندە گوناهی ئەگات هەروەها بۆ چاكەیش، كەواتە پرسیاری دواییەكان لە پێشوەكان ئەكرێت وە پێیان ئەوترێت چۆن ئەو ڕێبازەتان داهێنا؟ فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی كوشتنی یەك لەدووكوڕەی ئادەم بە دەستی ئەوی تریان‌و فەرمودەی{مَنْ سَن سُنةً حَسَنَةً...} و فەرمودەی{الدال عَلَىَ الخَير كَفَاعِلِهِ} ئەم ڕاستیەمان بە چاكی بۆ ڕۆشن دەكاتەوە، جا پێویستە ئێمەیش ویژدانمان هەبێت‌و پیاو چاكانی پێشوی خۆمان ئازار نەدەین‌و دوچاری حیسابی دوا ڕۆژیان نەكەین‌و قەبرەكانیان نەكەین بە جەژنگاو داوای شتێكیان لێ بكەین كە لە توانای ئەواندا نیەو نەیانكەین بە هاوبەشی خوا چونكە بێگومان خوای زاناو كار بە جێ ئەوانیش لە دادگادا بانگ دەكات‌و موحاسەبەیان ئەكات لەسەر ئەم داوا كاری‌و بۆ چوونەی ئێمە سەبارەت بەوان ئەوەتە خوای گەورە عیسا عليه السلام كە پێغەمبەرێكی خاوەن شەریعەتە موحاسەبە دەكات لەسەر قسەی بە ناو پەیڕەوانی (تەماشای ئاخیری سورەتی مائیدە بكە)ئایا كێ هەیە لە عیسا عليه السلام بەرزتر تا لەو موحاسەبەیە ڕزگاری ببێت؟ دەی با نەفامەكان واز بێنن لە شێخ‌و پیاو چاكەكانمان‌و دوچاری ئەو موحاسەبە سەختەیان نەكەن، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەپارێتەوە لەگەڵەكەی كەگۆڕەكەی نەكەن بەجەژنگەودەفەرموێ: {لَا تَعلُوا بُيُوتَكُمْ قُبُورًا وَلَا تَجْعَلُوا قَبْرِي عِيدًا وَصَلُّوا عَلَيَّ فَإِن صَلَاتَكُمْ تَبلُغُ ـ حَيْثُ كُنْتُمْ/ أبوداود.صححه الالبا / ماڵەكانتان مەكەن بەگۆڕو گۆڕەكەم مەكەن بە جەژنگاو سڵاوتم لەسەربدەن لەهەر كوێدابن پێم دەگات} منیش ئەڵێم:وصلى الله على النبى الامى محمد وعلى اله واصحابه اجمعين. ئینجا دوای ئەمانە ئەچێتەوە سەر مەسەلەیەكی زۆر گرنگ لە مێژوی ئیسلام دا ئەویش مەسەلەی قیبلەیە. لە پێشەوە پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژدا ڕوی دەكردە(بیت المقدس) لە دوایدا خوای گەورە گۆڕای‌و كردی بە كەعبە. بە ڕاستی ئەمە تاقیكردنەوەیەكی گەورەی سەردەم بو تا پاك‌و ناپاك لە یەكتر جیا بكرێتەوەو دەم كوتێكیشە بۆ ئەو كەسانەی كە دەڵێن: بەرژەوەندی پێش هەمو شتێكە، لە ڕاستیدا وا نیە، بەڵكو دەرگای تاقیكردنەوەی موسڵمانان كراوەیەو تا دوا هەناسەی لە هەمو بوارێكدا تاقی دەكرێتەوە چونكە بەو تاقیكردنەوەیە ڕاستی‌و ناراستی مرۆڤ دەردەكەوێت‌و عادەت‌و عیبادەت لە یەك جیا دەكرێنەوە خوای گەورە دەفەرموێ:

۞ سَيَقُولُ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَ ٱلنَّاسِ مَا وَلَّىٰهُمۡ عَن قِبۡلَتِهِمُ ٱلَّتِي كَانُواْ عَلَيۡهَاۚ قُل لِّلَّهِ ٱلۡمَشۡرِقُ وَٱلۡمَغۡرِبُۚ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٤٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَٰكُمۡ أُمَّةٗ وَسَطٗا لِّتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِ وَيَكُونَ ٱلرَّسُولُ عَلَيۡكُمۡ شَهِيدٗاۗ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلۡقِبۡلَةَ ٱلَّتِي كُنتَ عَلَيۡهَآ إِلَّا لِنَعۡلَمَ مَن يَتَّبِعُ ٱلرَّسُولَ مِمَّن يَنقَلِبُ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِۚ وَإِن كَانَتۡ لَكَبِيرَةً إِلَّا عَلَى ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِيعَ إِيمَٰنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٣﴾ قَدۡ نَرَىٰ تَقَلُّبَ وَجۡهِكَ فِي ٱلسَّمَآءِۖ فَلَنُوَلِّيَنَّكَ قِبۡلَةٗ تَرۡضَىٰهَاۚ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ لَيَعۡلَمُونَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٤﴾ وَلَئِنۡ أَتَيۡتَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ بِكُلِّ ءَايَةٖ مَّا تَبِعُواْ قِبۡلَتَكَۚ وَمَآ أَنتَ بِتَابِعٖ قِبۡلَتَهُمۡۚ وَمَا بَعۡضُهُم بِتَابِعٖ قِبۡلَةَ بَعۡضٖۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ إِنَّكَ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٥﴾

(١٤٢) له‌ مه‌ولا كه‌ قیبله‌مان گۆڕی بۆ تۆ ئه‌ی محمد ﷺ وه‌ رومان كردیته‌ كه‌عبه‌ سه‌فیهه‌كان ده‌ڵێن چ شتێكه‌ ئه‌وانه‌ی چه‌رخاندوه‌ له‌ قیبله‌ی یه‌كه‌م كه‌ له‌ سه‌ری بوون؟ خوای گه‌وره‌ ده‌مكوتی كردن‌و فه‌رموی: ئه‌ی محمد ﷺ پێیان بڵێ رۆژهه‌ڵات‌و رۆژئاوا موڵكی خوایه‌و هه‌ر چۆنێك خوای گه‌وره‌ ئه‌مر بكات من وا روده‌كه‌م‌و هه‌ر كه‌سێك كه‌ ئاره‌زوی لێ بێت رێنمایی ده‌كات بۆ رێگای راست.

(١٤٣) هه‌روه‌ها ئێوه‌مان دانا به‌ ئوممه‌تێكی مام ناوه‌ندی نه‌وه‌ك ئه‌وانه‌ن كه‌ ده‌ڵێن خوا نیه‌و نه‌وه‌ك بت په‌رستو موشریكه‌كانیش كه‌ ده‌یان خوای ناڕاستیان بۆ خۆیان داناوه‌، به‌ڵكو ئێوه‌ ده‌ڵێن خوا هه‌یه‌و ته‌نیایه‌. وشه‌ی(**وَسَطًا**) به‌ مانای چاك‌و خێر هاتوه‌ واته‌ به‌ راستی ئێوه‌ ئوممه‌تێكی چاك‌و به‌خێرن. وه‌ك ده‌فه‌رموێ: ﴿ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ :ئێوه‌ چاكترین گه‌لن خوا هه‌ڵی بژاردون بۆ خه‌ڵك﴾ ئالی عمران /١١٠، تاكو شایه‌ت بن له‌ رۆژی قیامه‌تدا له‌سه‌ر خه‌ڵك‌و ئه‌و كاته‌ش پێغه‌مبه‌ر ﷺ شایه‌ت ده‌بێت له‌سه‌ر ئێوه‌.

پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ: {**يَجِيءُ نُوحٌ وَأُمَّتُهُ فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى هَلْ بَلَّغْتَ فَيَقُولُ نَعَمْ أَيْ رَبِّ فَيَقُولُ لِأُمَّتِهِ هَلْ بَلَّغَكُمْ فَيَقُولُونَ لَا مَا جَاءَنَا مِنْ نَبِيٍّ فَيَقُولُ لِنُوحٍ مَنْ يَشْهَدُ لَكَ فَيَقُولُ مُحَمَّدٌ ﷺ وَأُمَّتُهُ فَنَشْهَدُ أَنَّهُ قَدْ بَلَّغَ وَهُوَ قَوْلُهُ جَلَّ ذِكْرُهُ وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُهَدَاءَ عَلَى النَّاسِ وَالْوَسَطُ الْعَدْلُ** /البخاري/ رۆژی قیامه‌ت نوح‌و ئوممه‌ته‌كه‌ی دێن، جا الله پێی ده‌فه‌رموێ: ئایا په‌یامت گه‌یاندوه‌، ئه‌ویش یه‌ژێ: به‌ڵێ ئه‌ی په‌روه‌ردگارم، جابه‌ گه‌له‌كه‌ی ده‌فه‌رموێ: ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ به‌رنامه‌كه‌ی منی پێی راگه‌یاندن ئه‌وانیش ده‌ڵێن: هیچ پێغه‌مبه‌رێكمان بۆ نه‌هاتوه‌ جا به‌ نوح ده‌فه‌رموێ: كێ شایه‌تیت بۆ ده‌دات؟ ئه‌ویش ده‌ڵێت: محمد ﷺ و ئوممه‌ته‌كه‌ی، جا ئێمه‌ش شایه‌تی ده‌ده‌ین كه‌ نوح به‌رنامه‌ی (الله)ی به‌ گه‌له‌كه‌ی راگه‌یاندوه‌، جا ئه‌مه‌ واتای ئه‌م ئایه‌ته‌یه‌.}

كاتێ كه‌ پرسیار ده‌كرێت ئه‌م ئوممه‌ته‌ چۆن ده‌زانن ده‌ڵێن: یاره‌بی ئێمه‌ باوه‌ڕمان به‌ پێغه‌مبه‌ره‌كه‌ی تۆ بو، باوه‌ڕمان به‌ كه‌لامه‌كه‌ی تۆ بو، تۆ له‌ كه‌لامه‌كه‌ی خۆتدا فه‌رموته‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ره‌كانت ته‌بلیغیان كردوه‌و ئوممه‌ته‌كان سه‌رپێچیان كردوه‌و به‌ گوێیان نه‌كردوه‌ ئێمه‌ له‌سه‌ر ئه‌وه‌شایه‌تی ده‌ده‌ین‌و پێغه‌مبه‌ریش شاهێده‌ له‌ سه‌رمان كه‌ ده‌فه‌رموێ: به‌ڵێ ئوممه‌ته‌كه‌ی من راست ده‌كه‌ن‌و ئه‌و په‌یامه‌یان پێگه‌یشتوه‌و شایه‌تیه‌كه‌یان راسته‌. جا ته‌ماشا كه‌ین چ ئوممه‌تێكی خێرین، چ ئوممه‌تێكی به‌رزین، ئاخرین ئوممه‌تین، وه‌ ئه‌وڵین ئوممه‌تین ده‌چینه‌ به‌هه‌شته‌وه‌ یه‌كه‌م كه‌س كه‌ ده‌رگای به‌هه‌شتی بۆ ده‌كرێته‌وه‌ پێغه‌مبه‌ره‌ ﷺ له‌ پاشان ئوممه‌ته‌كه‌ی ئه‌وه‌.

ئینجا ده‌فه‌رموێ: ئێمه‌ ئه‌و قیبله‌یه‌ی كه‌تۆی له‌سه‌ربوه‌ نه‌مانگۆڕیوه‌ مه‌گه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ بزانین كێ په‌یڕه‌وی له‌ پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌كات‌و كێش سه‌رپێچی ده‌كات‌و پاشگه‌ز ده‌بێته‌وه‌. كه‌واته‌ تاقیكاری شتێكی بناغه‌ییه‌و ده‌بێ مرۆڤ تاقی بكرێته‌وه‌ له‌م ژیانه‌داو به‌ بێ تاقیكاری له‌م ژیانه‌دا مرۆڤ رزگاری نابێ. هه‌روه‌كو خوا ده‌فه‌رموێ:﴿ هه‌رگیز خوا واز له‌ باوه‌ڕداران ناهێنێت هه‌تاپاك‌و پیس له‌ یه‌ك جیا نه‌كاته‌وه‌ ﴾ ئالی عیمران/١٧٩.

پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستمان ﷺ پاش تێپه‌ڕبونی شانزه‌ یان حه‌ڤده‌ مانگ له‌ كۆچی، خوای گه‌وره‌ ئاره‌زۆ ناو ده‌روونیه‌كه‌ی هێنایه‌ دی‌و قیبله‌ی بۆ گۆڕی‌و روی كرده‌ كه‌عبه‌ له‌ نوێژی عه‌سردا، وه‌ له‌ نوێژی به‌یانی دا له‌ كاتێكدا كه‌ موسڵمانه‌كان له‌ مزگه‌وتی قوبادا له‌ روكوعدا بون كه‌سێك هات وتی: ئه‌شهه‌دو بیللا قیبله‌ گۆڕاوه‌ به‌ كه‌عبه‌. جا نوێژ خوێنه‌كان هه‌ر له‌و حاڵه‌ته‌دا چه‌رخانه‌وه‌ به‌ره‌و كه‌عبه‌و نوێژه‌كه‌یان ته‌واو كرد، واته‌: سه‌ره‌تای نوێژه‌كه‌یان تا زیاتر له‌ ركاتێكی روویان له‌ به‌یتولوقه‌ده‌س بوه‌و له‌ ئاخیری‌و له‌ سه‌لامدانه‌وه‌دا روویان له‌ كه‌عبه‌ بوه‌، ئه‌وان ئا به‌و شێوه‌یه‌ له‌ ئیسلام تێگه‌یشتن بۆیه‌ هه‌موویان بون به‌ مامۆستای جیهان‌و هه‌تا هه‌تایه‌ مێژو شانازیان پێوه‌ ده‌كات،

ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ وَإِنَّ فَرِيقٗا مِّنۡهُمۡ لَيَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٤٦﴾ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿١٤٧﴾ وَلِكُلّٖ وِجۡهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَاۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ أَيۡنَ مَا تَكُونُواْ يَأۡتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٤٨﴾ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ وَإِنَّهُۥ لَلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿١٤٩﴾ وَمِنۡ حَيۡثُ خَرَجۡتَ فَوَلِّ وَجۡهَكَ شَطۡرَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۚ وَحَيۡثُ مَا كُنتُمۡ فَوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ شَطۡرَهُۥ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَيۡكُمۡ حُجَّةٌ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِي وَلِأُتِمَّ نِعۡمَتِي عَلَيۡكُمۡ وَلَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥٠﴾ كَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِيكُمۡ رَسُولٗا مِّنكُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِنَا وَيُزَكِّيكُمۡ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَيُعَلِّمُكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿١٥١﴾ فَٱذۡكُرُونِيٓ أَذۡكُرۡكُمۡ وَٱشۡكُرُواْ لِي وَلَا تَكۡفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٣﴾

بەڵێ ئەوان چاكترین گەلو شایەتن لەسەر ئوممەتان نەك ئێمەی بە ناو موسڵمانو بە ناوەڕۆك دەرمانی هەزار دەردان لە جیاتی گوێ رایەڵیو پەیڕەوی ڕاست وڕەوان لە ئیسلام بكەین گوێ نادەین بە ئیسلامو هیچ نرخێك دانانێین بۆ پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بەڵكو بە سازو سەمتوری دوژمنانمان سەمادەكەین!! بەڵێ بە ڕاستی ئەم كۆمەڵە پاكە تاقیكرانەوەو چاكیش لەو تاقیكردنەوە گرنگەدا دەرچون ، هەروەك خوا خۆی دەفەرموێ: بە ڕاستی ئەم گۆڕانكاریە ئیشێكی زۆر سەخت بو مەگەر لای ئەو كەسانەی كە خوا هیدایەتی دابون.

ئاشكرایە هەندێك لەو تاقیكردنەوەیەدا دەرنەچونو جوولەكەكانیش كەوتنە بڵاو كردنەوەی پڕوپاگەندە دژی پێغەمبەرﷺو ئایینە پیرۆزەكەی هەروەك لە پێشەوە دەیان وت: ئەگەر ئایینی ئێمە ڕاست نیە محمد ﷺ بۆ ڕودەكاتە قیبلەكەمان، ئینجا كاتێ كە گۆڕا وتیان: محمد ﷺ دوو دڵەو دانەمەزراوەو دەیان وت: دیارە هەر كەسێك كە لە پێشەوە بەرەو بەیتولوقەدەس نوێژی كردوەو مردوە تاوانبارە چونكە نوێژەكەی بەتاڵ بوەتەوەو نوێژی ئەمانەیش كە ماون تا ئێستا بێ سوود بوە، خوای گەورە بە توندی دەمكوتی كردنو فەرموی: خوا بەندایەتیو نوێژی ئێوە بەتاڵ ناكاتەوە چونكە بە ڕاستی خوا زۆر میهرەبانو بە سۆزە بەرامبەر بە خەڵكو چاوپۆشی لە تاوانی خەڵك دەكات ئیتر چۆن چاكەی چاكە كارانی بەندەی باوەڕداری خۆی بەتاڵ دەكاتەوە؟ ئینجا خوای زاناو كار بەجێ درێژە بە باسی قیبلە دەداتو دەفەرموێ:

﴿١٤٤﴾ بەراستی ئێمە دیمان كە تۆ هەمیشە چاوت هەڵدەبڕی بەرەو ئاسمانو چاوەڕوانیت دەكرد كە ئێمە ئەو قیبلەیەت بۆ بگۆڕین لە بەر ئەوە ئێمە ڕووی تۆ دەكەینە قیبلەیەك كە تۆ پێی ڕازی بیت، جا تۆ ڕووی خۆت بكەرە ناوەڕاستی یان بەرەو(مسجد الحرام) كە بریتیە لەویەكەم مزگەوتەی كە لە مەكەدا بۆهەمو خەڵك دروستكراوە، ئێوە ئەی خاوەن باوەڕان لە هەر كوێدا بن سا ڕووی خۆتان بكەنە ئەو ماڵەی خواو پێویستە ئەوەی كە خەڵكی مەكەیە ڕوو بكاتە مزگەوتەكەو خەڵكی تریش ڕوو بكەنە مەكە، واتە: سەدا سەد واجب نیە ڕووبكاتە مزگەوتەكە بەڵكو بە ڕەئی خۆی ڕوی لەو مزگەوتەوە بێت بەسە، بە ڕاستی ئەو كەسانەی كە كتێبیان پێ دراوە كە گاوڕو جوولەكەكانن هەردووكیان دەزانن كە ئەمە ڕاستەو لە لایەنی خوای خۆیانەوەیە چونكە دەیانزانی كە یەكێك لە سیفەتەكانی پێغەمبەرﷺ ئەوەیە كە قیبلەكەی كەعبەیە، بەڵام لە پێشەوە لە بەر قازانجی خۆیان شاردبوویانەوەو نەیان دەگووتو ئەگەر دەوامیشی بكردایە لەسەر قیبلەی پێشوو دەیان وت: تۆ ئەو پێغەمبەرە نیت چونكە سیفەتی ئەو پێغەمبەرە وایە كە دەبوایە ڕووبكاتە ئەو كەعبەیە، وە خوا بێ ئاگا نیە لەوەی كە ئەوان دەیكەن واتە: ئاگای هەیە لە هەمو فرووفێڵەكانیان.

وشەی (شَطۡرَ) واتە نیوە یان بەرەو ئەوماڵە. ئینجا خوا سرنجمان ڕادەكێشێت بۆ ناسینی دوژمنانو كەللە ڕەقیانو دەفەرموێ:

﴿١٤٥﴾ تۆ هەرچی بەڵگە بێنیتەوە لەسەر ئەوەی كە قیبلەكەت ڕاستو حەقە هەرگیز ئەهلی كتێب باوەڕت پێ ناكەنو پەیڕەویت ناكەنو تۆش هەرگیز بەدوای قیبلەی ئەواندا ناڕۆیت، واتە: هەر چۆن ئەوان بەتوندی وەستاون لەسەر ئاینەكەی خۆیان، تۆش ئاوا توند بە لەسەر ئاینەكەی خۆت، ئەمە ڕاستیو خۆگری پێغەمبەرمانﷺ پیشان ئەدات، تەنانەت ئەوان لە ناو خۆیاندا ڕو لەقیبلەی یەكتر ناكەنو هەریەكەو بۆ خۆیان قیبلەیەكیان داناوە، جا ئەگەر تۆ پەیڕەوی لە ئارەزۆی ئەوان بكەیت پاش ئەوەی كە ئەم حەقیقەتو زانینە هاتوەتە لات، بێگومان ئەو كاتە ئەی محمد ﷺ تۆ لە ستەمكاران دەبیت. ئەی ئیمڕۆ ئێمە كە پەیڕەوی ئەوانین دەبێ لای خوا چ حیسابێكمان بۆ بكرێت؟ ئەمە هەڕەشەیەكە بۆ پێغەمبەر ﷺكە هەڕەشە بۆ پێغەمبەر ﷺ بو بۆ ئێمەیە، كورد واتەنی "دیوار بە تۆمە، پاسار گوێت لێ بێ".

(١٤٦) ئەو کەسانەی کە ئێمە کتێبمان پێ داون وەك تەوراتو ئینجیل بە راستی محمد دەناسنو دەزانن کە ئەو پێغەمبەرەﷺ و راستە هەر چۆن کوڕی خۆیان دەناسن کە کوڕی خۆیانە، هەر ئاوەها پێغەمبەریشﷺ دەناسن، بەبێگومان کۆمەڵێك لەوان راستیان شاردوەتەوە لەحاڵێکدا کە خۆیشیان دەزانن حەقوراستی کامەیە.

ئەمە بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کەکردار مەرجە بۆباوەڕی ناودەرون ودان پێدا نان چونکە ئەوان بەشایەتی قورئان پێغەمبەریان ﷺ بەباشی ناسیوەو لەناوخۆیشیاندا ئەمەیان درکاندوە، جا ئەگەر باوەڕ هەر ناودەرونیو دان پێدانان بێت بەبێ کردار ئیتربۆ ئەوان کافرن؟ وردبەرەوە.

(١٤٧) ئەی محمد ﷺ حەقو راستی هەر ئەوەیە کە لە لایەنی پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە ئەوسا تۆ لەوانە نەبی کەوا بکەویتە گومانەوە لەو شتانەی کە بۆت باس دەکرێت. وەك دەفەرموێ: ﴿ئەگەر تۆ لە بارەی ئەم پەڕاوەوە کە بۆمان ناردویت گومانت هەیە پرسیار بکە لەوانەی کە لە پێش تۆدا کتێبیان خوێندوتەوە﴾ یونس:٩٤.

(١٤٨) بۆ هەمو گەلێك قیبلەیەك هەیە کە روی تێدەکەن، دەسا پەلەبکەن بۆ چاکەکردن لەهەرکوێدا ببن خوا هەموتان کۆ دەکاتەوە، بێگومان کە ﷲ تواناییودەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە.

واتە: هەمو تاقمو حیزبێك بەوەی کەلای خۆیەتی کەیف خۆشەو هەر کەسێك جێگایەکی تایبەتی هەیەو دەیپەرستێتو هەر کەسێك مەحبووبێکی هەیە دوای مەحبوبەکەی کەوتوەو هەر کەسێك رۆگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە وابۆ ئێوەش وەك خەڵکانی تر قیبلەمان دیاری کرد کەواتە ئەمە شتێکی نامۆ نیە کە ئێمە قیبلەی فەلەو قیبلەی جوومان بە تۆ نەداوە، بەڵکو قیبلەیەکی تایبەتیمان بە تۆ داوەولەچاکە کردنیش مەترسن چونکە بەدڵنیاییەوە هیچی ون نابێتو لەهەر کوێدا ئەنجامی بدەن سەرەنجام پێتان دەگاتەوە. هەر سەبارەت بە قیبلە جارێکی تر دەفەرموێ:

(١٤٩) لە هەر کوێدا دەرچویتو لە هەر کوێدا بویت، ئەوسا روو بکەرە (مسجد الحرام) کەبە راستی ئەو گۆڕانو رووتێکردنەی تۆ شتێکی راستەولە لایەنی پەروەردگاری خۆتەوەیەو خوا بێ ئاگا نیە لەوەی کە ئێوە دەیکەن. ئینجا خوای گەورە روو دەکاتە پێغەمبەر ﷺ و هەمو باوەڕدارانو دەفەرموێ:

(١٥٠) بەرەو هەر کوێ رۆیشتیتو لە هەر کوێدا بویت رووبکەرە (مسجد الحرام)وئێوەش ئەی گەلی موسڵمان لە هەر کوێ دا بن رووبکەنە مزگەوتی حەرەم. بۆچی ئەمەمان کردوە؟ تا هیچ بەڵگەیەك نەمێنێت بۆ خەڵك لەدژی ئێوە، بێجگە لە ستەمکارانیان کەئەوانە قسەی پیسی خۆیان هەردەکەن باسور بزانن کەناحەقیشن چونکە ئەوان بازارێکی وایان داناوە لەگەڵ نەبونی ئاییندا ئەوان دەتوانن بژین، کە ئایین بوو ئەوان ناژین. کەواتە هەمیشە دژایەتی ئایین دەکەن. جا خوای گەورە دەفەرموێ: مەترسن لەوانو تەنها لە من بترسن تا من نیعمەتی خۆمتان بۆ تەواو بکەم کە ئەم ئایینەیەو بەو هیوایە کە رێگای هیدایەت بگرنو دوای راستی بکەون، بەڵێ ئەگەر بەو زوانە نەگۆڕایە دەیان وت: ئەگەر محمدﷺ ئایینەکەی راستەو دوای ئاینی ئیبراهیم ﷺ کەوتوە بۆ روناکەتە کەعبە؟! بۆ روودەکاتە بەیتو لموقەددەس؟

(١٥١) هەروەکو چۆن لە ناو خۆتاندا پێغەمبەرێکمان لە خۆتان بۆ ناردون کە نیشانەکانی ئێمەتان بۆ دەخوێنێتەوەو پاکتان دەکاتەوە لەبت پەرستیو رەوشتی ناپەسەند و کتێبو حیکمەتتان فێر دەکاتو فێری شتانێکتان دەکات کە ئێوە هەرگیز نەتانزانیوە وەك دەنگوباسی هەندێ لەگەڵە پێشووەکانو باسی قیامەتو ئەو نیعمەتانەی کە لە بەهەشتدا هەیەو جەهەننەمو جۆری سزاکانیو چەندین رێنمونی تر کە بەم شێوەیە نەزانراوە.

دەگونجێ کافی ( كَمَآ ) بە مانای )لام( بێت واتە بەو هیوایە کە ئێوە رێگای هیدایەت بگرنو..، یان بەو مانا بێت کە وتمان.

(١٥٢) سا ئێوەش یادی من بکەن منیش یادی ئێوە دەکەم. سوپاسی من بکەن وسپڵەو نمەك نەناس مەبنو پێم بێ باوەڕ مەبن. تەماشا کەن خوای گەورە چەند بە سۆز ومیهرەبانە.

لە فەرمودەی قودسی دا هاتوە کە خوای گەورە دەفەرموێ: {يَا ابْنَ آدَمَ إِنْ ذَكَرْتَنِي فِي نَفْسِكَ ذَكَرْتُكَ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرْتَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُكَ فِي مَلَإٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ أَوْ فِي مَلَإٍ خَيْرٍ مِنْهُمْ /أ د. صححه الالبا / ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر لە نەفسی خۆتان دا یادم بکەن لە نەفسی خۆمدا یادتان دەکەم، ئەگەر لە ناو کۆمەڵێکدا یادم بکەن من لە ناو کۆمەڵێکی فریشتە یان کۆمەڵێکی چاکتر لەو کۆمەڵەی ئێوە یادتان دەکەم} جا تەماشا بکەن خوای گەورە چەند بە فەزڵو میهرەبانە بەرامبەر بە مرۆڤ وەك دەفەرموێ: (خوا ئەو زاتەیە کە خۆیو فریشتەکانیشی سەڵاوات لە ئێوە دەدەن تا لە تاریکاییەکان دەرتان بهێنێ بۆروناکیو ئەو زاتە زۆر میهرەبانە بۆ باوەڕداران﴾ ئەحزاب/ ٤٣

وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَن يُقْتَلُ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتٌۢ ۚ بَلْ أَحْيَآءٌ وَلَٰكِن لَّا تَشْعُرُونَ ﴿١٥٤﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌ قَالُوٓا۟ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ صَلَوَٰتٌ مِّن رَّبِّهِمْ وَرَحْمَةٌ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُهْتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ۞ إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنْ حَجَّ ٱلْبَيْتَ أَوِ ٱعْتَمَرَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا ۚ وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ ٱللَّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَيْهِمْ لَعْنَةُ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٦١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿١٦٢﴾ وَإِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ ۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحْمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٦٣﴾

لێرەشدا دەفەرموێ: (یادم بکەن یادتان دەکەم وە شوکرم بکەن‌و کفرم نەکەن) بۆ؟ چونکە دەفەرموێ: ﴿ئەگەر شوکرم بکەن زیاتری دەکەم بۆتان وە ئەگەر ناسوپاسی بکەن بە راستی سزام سەختە﴾ ئیبراهیم /٧

بەڵێ مرۆڤی موسڵمان توشی بەڵاو موسیبەت‌و نارەحەتی زۆر دەبێت‌و لە ناخۆشیەك رزگاری دەبێت دەچێتە ناو ناخۆشیەکی ترەوە واتە ئیسراحەت ناکات‌و دنیا خانوی گرفتاریە.

وەك دەفەرموێ: ﴿ بێگومان تۆ زەحمەت زۆر دەکێشی بەرەو خوای خۆت سا پێی دەگەیت﴾ ئینشقاق/٦ مادام وایە ئەی دەرمانی ئەو هەمو زەحمەتانە چیە؟ وتمان دوو دەرمانی هەیە کە یەکێکیان خۆگرییەو ئەوی تریان بریتیە لە نوێژ کە لێرەدا لەبەرگرنگیان دووبارەی کردۆتەوەو دەفەرموێ:

﴿١٥٣﴾ ئەی باوەڕداران کۆمەك بخوازن‌و داوای یارمەتی بکەن بۆ خۆتان‌و هێز پەیدا بکەن بە خۆگری‌و بە نوێژ. جا چۆن ئەم دوو شتە ئەبن بە هۆی هێزو توانا؟ چونکە﴿بێگومان کە ﷲ لەگەڵ خۆگراندایە﴾ هەروەها دەفەرموێ: ﴿خۆگران پاداشی بێ ژمارەیان هەیە﴾ زومەر/١٠. وە نوێژیش چونکە هێڵێکی راستەوخۆیە لە نێوان بەندەو خواداو بەو روو تێکردنە دڵی بتەوتر دەبێت‌و دەتوانێ رازو نیاز لەگەڵ خوای خۆیدا بکات کە ئەمە ئەبێ بە هۆی ئارامی‌و خۆگری‌و دڵخۆشی مرۆڤ‌و دەزانێ کە خوا خاوەنی سۆزەو ئاگای لە نارەحەتی‌و سەختیەکانی ئەو هەیەو ناگونجێ هاواری ئەو بێ سوودو بێ کەڵك بێت بەڵکو باوەڕ پەیدا دەکات کە ئەم بارە گرانە زۆر بە سوودە بۆی چ لەم دنیایە چ لەو دنیادا، بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ هەر کاتێك کە تەنگ‌و چەڵەمە یەخەی دەگرت دەیفەرمو: { ئەی بیلال کەیف خۆشمان بکە} واتە بانگ بدە با نوێژ بکەین بەمە کەیف خۆش دەبین.

بەڵێ خۆگری‌و نوێژە دەرمانی هەمو برینەکانی خاوەن باوەڕان‌و بەو دووانە دەتوانن سەرکەون بە سەر تەواوی تەنگو چەڵەمەو دوژمنانیاندا ئیتر دوژمنی ناوەکی بێت وەك نەفس‌و شەیتان یان دوژمنی دەرەکی وەك ستەمکاران‌و موشریکان‌و بێ باوەڕان. ئینجا دەچێتە سەر باسی ئەو کەسانەی کە لە رێگای خوادا شەهید دەبن. ئەدەبی مرۆڤی موسڵمان دەبێ چۆن بێت بەرامبەر بەو کەسانەی کە لە رێگای خوا دا شەهید دەبن، وەدەبێ چۆن بیر بکاتەوە سەبارەت بەوان؟دەفەرموێ:

﴿١٥٤﴾ نەڵێن بەو کەسانەی کە لە رێگای خوادا دەکوژرێن مردوون بەڵکو ئەمانە زیندوون بەڵام ئێوە هەستی پێ ناکەن.

لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: نابێ بە زمان بڵێین وە لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ گومان نەکەن ئەوانەی کە لە رێگەی خوادا کوژراون مردوون نەخێر، ئەوانە زیندوون کەلە لایەن خوای خۆیانەوە رزق‌و رۆزیان پێ دەدرێ﴾ئالی عیمران/١٦٩. واتە نابێ گومانیشی لە نە مردنی ئەواندا هەبێت چونکە شەهید کە ژیانی خۆی لەپێناو ﷲ دا بەخت کردوە پەروەردگاری لەباتی ئەو ژیانەی، ژیانێکی وای پێ‌دەدات کە چۆنییەتێکەی بۆ ئێمە دەرك ناکرێت کەواتە حەق نیە بە هیچ شێوەیەك بوترێت مردوە یان گومانی مردنی لێ بکرێت چونکە مرۆڤی زیندو دوو حاڵەتی هەیە یان خەوو خواردن‌و ئیسراحەت یان ئەبێت بە هۆی جوڵاندنی خەڵك‌و قسە کردن لەگەڵ خەڵکداو بڵاو کردنەوەی ئاینی خوا لە ناو خەڵکدا. لە راستی دا شەهید هەردووکیانی هەیە بەدەقی قورئان لەوێ رزقیان دەدرێتێ ﴿عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ /آل عمران: ١٦٩/ لای پەروەردگاریان رزق‌و رۆزیان پێ‌دەترێت﴾ واتە خواردن‌و ئیسراحەتیان هەیە، هەروەها لە فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ: {أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَسْرَحُ مِنْ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ اطِّلَاعَةً فَقَالَ هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا قَالُوا أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنْ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا قَالُوا يَا رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا/مسلم / گیانیان لە ناو لەشی باڵندەیەکی سەوزدایە کەچەندین چرای هەڵوەسراو بە عەرشیان هەیە کە لە ناو

بەهەشتدا بە ئارەزۆی خۆیان دەسوڕێنەوە، لەپاشاندا بۆ حەوانەوە دێنەوە لای ئەولالانە، جا پەروەردگاریان جارێك خۆیان لێ ئاشكرا دەكات و پێ یان دەفەرموێ: ئایا شتی ترتان دەوێت؟ دەڵێن: جا چیمان بوێت لەحاڵێكدا لەم بەهەشتەدا بەئارەزۆی خۆمان دەسوڕێینەوە؟ سێ جار ئەم پرسیارەیان لێ دەكات، جا كاتێ كە دەزانن وازیان لێ ناهێنرێت هەردەبێ داوای شتێك بكەن، وتیان: ئەی پەروەردگارمان دەمانەوێ گیانمان بكەیتەوە لەشمان تا جارێكی تر لەرێگای تۆدابكوژرێینەوە. جاكاتێ دەبینێت كە هیچ پێویستیەكیان نیەو هەموشتێكیان بۆ دابینكراوە وازیان لێدەهێنرێت}

كەواتە ژیانانیشیا هەیە. جائەوان چۆن لە دنیادا خواردنو خواردنەوەیان هەبوو، لەوێش خواردنو خواردنەوەیان هەیە بە زیاترەوەو چۆن لە دنیادا خەڵكیان تەحریك دەكردو هەڵیان دەنان بۆ جیهاد بە شەهادەتەكەیان خەڵك زیاتر دەجوڵێنن، جا نەك هەر مرۆڤی باوەڕدار بەڵكو كوشتنی هەر كەسێك لە ناو قەومێكا بە دەستی قەومێكی تر دەبێت بە هۆی جوڵانی قەومەكە واتە: ئەو كوشتنە ناحەقەی زۆر گڕو تین دروست دەكات، لە ناو قەومەكەیدا، بەلام ئەگەر لە رێگەی خوادابێت گڕو تینەكەی زۆر زیاتروبەتین ترە لەدڵی باوەڕداراندا.

جا وا جارێكی تر قورئان سرنجمان رادەكێشێ بۆ لای تەنگو چەڵەمەو سەختی پاش ئەوەی كە دەرمانەكانی بۆ باس كردین (خۆگری‌و نوێژ) تا رۆڵە بە جەرگو نەبەزەكانی ئیسلام فێری خۆگری‌و مەردانەیی بكاتو لە هیچ كۆسپێك سڵ نەكەنو بزانن كە دنیا خانوی تاقی كردنەوەیەو هیچی تر، هەروەك خوای گەورە لە سورەتی (ملك/٢ دا دەفەرموێ:﴿ ئەوزاتەیە كە مەرگو ژیانی دروستكردوە تا تاقیتان بكاتەوەودەركەوێت كە كامتان ئیشی باشتر دەكەن﴾ لێرەش دا دەفەرموێ:

(١٥٥) بەدڵنیاییەوە تاقیتان دەكەمەوە بە شتێك لە ترسو برسێتی‌و بە كەمكردنەوە لەماڵو سەروەتتانو لە خۆتانو بەروبومتان. لێرەدا ترسی پێش خستوە چونكە ترس بۆ مرۆڤ لە هەمو شت مەترسی دارترە ئەگەر ترس پەیدا بوو مرۆڤ خزمو كەس‌و كاریشی لە بیر نامینێ، هەموی لە بیر دەچێت. بە راستی مرۆڤ بە برسێتی زۆر تەنگاو دەبێت. بیستومە هی وا هەبوە كە برسی بوە منداڵی خۆی كوشتوەو خواردویەتی‌و ئەمانی تر كەمێ ئاسانترن ئەمانە تەنهابۆ تاقی كردنەوەی خەڵكن لە دنیادا تا هیچ بەڵگەیەكی بە دەستەوە نەبێتو بەهانەی نەمێنێت لە قیامەتدا، بۆیە دەفەرموێ: مژدە بدە بە خۆگران. كامەیە وەسفی خۆگران؟ دەفەرموێ:

(١٥٦) ئەو كەسانەن كە هەر گرفتارییەكیان توش بێت دەڵێن: ئێمە بەندەو دروستكراوی خواینو بۆ لای خۆی دەگەڕێینەوە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إذَا أَصَابَتْ أَحَدَكُمْ مُصِيبَةٌ فَلْيَقُلْ إنا لِلهِ وَإنا إلَيهِ رَاجِعُونَ اللهُم عِنْدَكَ أَحْتَسِبُ مُصِيبَتِي فَآجِرْنِي فِيهَا وَأَبْدِلْ لِي بِهَا خَيْرًا مِنْهَا/ ابوداود، صححه الالبا / هەر كاتێ یەكێك لەئێوە دوچاری گرفتێك هات بابڵێت: إنا لِلهِ وَإنا إلَيهِ رَاجِعُونَ/ ئێمە بەندەو دروستكراوی خواینو هەر بۆ لای خۆیشی دەگەڕێینەوە. ئەی خوایە داوای پاداشتی ئەم گرفتارییەم دەكەم ساپاداشم بدەرەوەو بیگۆڕەوە بۆم بە چاكتر لەوە}

وەهەروەها دەفەرموێ: {لَيْسَ مِنَّا مَنْ ضَرَبَ الْخُدُودَ، أَوْ شَقَّ الْجُيُوبَ. أَوْ دَعَا بِدَعْوَى الْجَاهِلِيَّةِ / متفق عليه / لە ئێمە نیە ئەو كەسەی لەرومەتی خۆی بدات یان جلی بدڕێنێت یان بانگو سڵا لێ بدات لەكاتی بەڵاوكۆس كەوتندا وەك سەردەی نەفامی} جا كاتێ كە ئاوەهایان وت: خوای گەورە بڕیاری سێ خەڵاتی گەورەو گرنگی پێ داون كە ئەمانەن:

(١٥٧) یەكەم - ئەوانە لافاوی لێ بوردنی پەروەردگاری خۆیان لە سەرە. دووەم - سۆزو رەحمەتیان بۆ دەنێرێتوبەر رەحمەتی ئەودەكەون. سێهەم - ئەوانە رێنمای كراونو رێگەی هیدایەتیان گرتوەو كەوتونەتە سەر شەقامە راستەقینەكەی ئایینی خوا. هەندێك پێیان وایە: ئەگەر مرۆڤێك موسڵمان بوو نابێ بكەوێتە ناو تەنگو چەڵەمەوە، پێویستە بزانن كە ئەم بۆ چوونە زۆر هەڵەیە، بەڵكو بەلاو ئێشو ئازار زۆرتر بۆ موسڵمانە وەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: { أَشَد النّاسِ بَلاَءً الأَنبِياءُ الأَمثَلُ فالأَمثَلُ يُبتلى الرجُلُ على حَسَبِ دِينِهِ فإنْ كانَ دِينِهِ صُلبًا اشْتَد بَلاؤُهُ وإنْ كانَ دِينِهِ رقةٌ أُبْتُلِيَ على قَدْرِ دِينِهِ فما يَبرَحُ البَلاءُ بالعَبْدِ حَتى يَترُكَهُ يَمْشِي على الأَرْضِ وما عليهِ خَطِيئةٌ / ا د وغ ه، صححه الالبا / ئەوەی لە هەموتان بەڵای زۆرتری تووش هاتوە پێغەمبەرانن، ئینجا كێ لە پێغەمبەران نزیكتر بێت بەڵای زیاترە، جا هەر پیاوێك بەگوێرەی ئایینەكەی بەڵای بەسەرا دەدرێت خۆ ئەگەر لەئایینەكەی دا بتەوو بەهێز بو بەڵاكەیشی توند دەبێتو ئەگەر لەئایینەكەی شل‌وشوڵ بو ئەوە بەڵاكەیشی بەگوێرەی ئایینەكەیەتی، جا بەڵا لەكوڵی بەندە نابێتەوە تاكاتێ كەبەجێی دەهێڵێت بەم سەرزەوییەدا دەگەڕێت لەحاڵێكدا كەهیچ تاوانێكی بەسەرەوەنامێنێت}

جا بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {عَجِبْتُ مِنْ أَمْرِ الْمُؤْمِنِ إِنَّ أَمْرَ الْمُؤْمِنِ كُلَّهُ لَهُ خَيْرٌ وَلَيْسَ ذَلِكَ لِأَحَدٍ إِلا لِلْمُؤْمِنِ إِنْ أَصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ كَانَ ذَلِكَ لَهُ خَيْرًا وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَرَّاءُ فَصَبَرَ كَانَ ذَلِكَ لَهُ خَيْرًا /ا د، صححه الالبا / سەرم سوڕدەمێنێ لە ئیشی باوەڕداران

کەکاروباری هەموی خێرەوئەمەش هەر بۆ باوەڕدار هەیە. ئەگەر نیعمەتی بە سەردا رژاند شوکری دەکات کە چاکەیە بۆی ـ چونکە خوا بە زیاد کردن بۆی پاداشتی دەداتەوە ـ و ئەگەر ناڕەحەتی تووش هات جا خۆی گرت ئەویش چاکەیە بۆی ـ چونکە خوای گەورە پاداشتی دەداتەوە ـ}.

(١٥٨) سەفاو مەروا هەندێکن لە دروشمەکانی ﷲ کە هاتوچۆ کردن بەو شێوەیەی کە شەریعەت باسی کردوە، مانای وایە رێز گرتنە لە فەرمانو ئەمری ﷲ، دەی هەر کەسێك حەجی بەیتی کرد یان عومرەی کرد هیچ گوناهی تێدا نیە کەتەوافی ئەم دووانە بکات هەر کەسێك زیاتر لە ئەندازەی خۆی چاکە بکات سوودی چاکی دەست دەکەوێت، چونکە بێگومان کە خوا پاداشتی سوپاس گوزاران دەداتەوە، زۆر زانەرە بە ئیشەکانتان.

دەڵێن ئەو سەفاو مەروایە کاتی خۆی لەسەر هەر یەکێکیان بتێکیان لەسەر دانا بوو موسڵمانەکان پێیان وابوو مادام بتیان لەسەر داناوە لە پێشا ئیتر نابێ ئەمڕۆ بچنە سەریان، بەڵکو پێویستە دژایەتی موشریکان بکرێت چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانمان پێدەکات کە بەپێچەوانەی موشریکانو کافران بجولێینەوە، هەرچی ئەوان دەیکەن ئێوە مەیکەن لە بەر ئەوە وتیان: ئەگەر بچین بۆ سەفاو مەروە تووشی گوناه دەبین، ئینجا خوای گەورە ئەم ئایەتەی رەوانە کردو فەرموی: نەخێر سەفاو مەروە دوو دروشمی خودان بە تەواف کردنیان گوناهتان لەسەر نانووسرێت.

پەیوەندی ئەم ئایەتە بە ئایەتی شەهادەتو خۆگریو نوێژەوە چییە؟

**یەکەم**: هەموویان بەندایەتین ئەمیش وەکو ئەوان.

**دووهەم**: ئیشی خوا ناسێکی خۆگر بوە هەتا قیامەت هەر باسی دەکرێتو یادگارێکی ئەو کاتەن کە خاتون (هاجەرە) منداڵەکەی بە جێ هێڵاو لە هەمو شتێك نائومێد ببو، وە لەنەمانو لەناو چون زۆر نزیك بوو، بەڵام چونکە بە راستی هاواری کردە خوا، خوای گەورە گەیشتە فریایو زەمزەمی پێدا کە بوبە هۆی ئاوەدانی شاری مەکەو هۆی دووبارە دروستکردنەوەنی کەعبە. جا هاتوچۆی سەفاو مەروە ئەوە دەخاتە بیری مرۆڤەوە کەئەی مرۆڤ تۆ رۆژێکی سەختی وات هاتوە بەسەرداو کەوتویتە حاڵەتێکی واوە کەغەیری من کەست شك نەدەبرد تەنها ئومێدت من بو دەی منیش هاتم بە هاوارتەوەو فریات کەوتمو ئەمەیشم کرد بەدروشمێك لە دروشمەکانی خۆم تا خاوەن باوەڕان دڵنیابن کە هەر کاتێ بەدڵێکی سافو بیروباوەڕێکی پاكو بەئاگاییەوە هاوار بکەنە من، منیش وەڵامیان دەدەمەوە. ئینجا سەبارەت بەو کەسانەی کەحەق دەشارنەوە دەفەرموێ:

(١٥٩) بێگومان ئەوکەسانەی کە دەیشارنەوە ئەوەی کەئێمە رەوانەمان کردوە لە نیشانە ئاشکراکانو رێنمایی پاش ئەوەی کە ئێمە بەیانمان کردوە بۆ خەڵك لە قورئان دا ئەوانە خوا نەفرینیان لێ دەکاتو هەمو لەعنەت چیەکانیش لەعنەتیان لێ دەکەن. بە راستی ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر قورسە بۆ ئەهلی عیلم کە خۆیان بە خوێندەوار دەزانن کە کۆمەڵێکی زۆر لە ئێمەی وەبەر دەکەوێت چونکە زۆر راستیمان شاردوەتەوەو زۆر راستی هەیە لەترسا یان لەبرسا نەمانتوانیوە بیڵێین.

(١٦٠) بێجگە لەو کەسانەی کە ئەم سێ شتانە ئەنجام ئەدەن: تەوبە بکەنو پەشیمان ببنەوە لەو هەڵەیەی کە کردوویانەو لەو هەڵوێستەی کە بویانەو ئیشی باش بکەنو ئەوراستیە بکەنەوەو بڵێن کە فلانە شتمان نەوتوە کە ئەمە راستیەکەیەتی. ئەو کاتە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوسا من تەوبەیان لێ وەردەگرمو بە راستی من تەوبە وەرگرمو زۆریش بە سۆزم.

ئەبو هورەیرەوە ﷺ دەڵێت: {ئەڵێن خەڵکی باسی ئەبو هورەیرەیان دەکرد دەیان وت: بۆ کۆچەریو یاریدەدەرەکان ئەوەندەی ئەو فەرمودە ناگێڕنەوە؟! ئەبو هورەیرە وتی: برایانی کۆچەریم مامەڵەی بازاڕ سەرگەرمی دەکردنو برایانی یاریدەدەریشم بەکاروباری خۆیانەوە سەرگەرم بوونو منیش مرۆڤێکی نەدار بوومو چەسپیام بەپێغەمبەرەوە ﷺ بە پڕەسکی خۆم رازی بوم، جا من کاتێ کە ئەوان نەبوون لەوێ من هەر لەوێ دەبومو ئەوەی کەئەوان لەبیریان دەچوویەوە من لەبەرم دەکرد، رۆژێکیان پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هیچ کام لە ئێوە پۆشاکی خۆی راناخات هەتا من لە قسەکانم دەبمەوەو لەپاشان کۆی بکاتەوە لەسەر سینگی خۆی، ئیتر هەرگیز هیچ شتێك لەقسەکانی منی لەبیر نەچێتەوە، جا منیش عەباکەی خۆم راخست کە جگە لەو هیچی ترم پێوە نەبو هەتا پێغەمبەر ﷺ لەقسەکەی بویەوە لەپاشان کۆم کردەوە لەسەر سینگم بەو کەسەی کە ئەوی بەحەق رەوانە کردوە لەو قسەیەوە هەتا ئیستا هیچم لەبیر نەچوەتەوە بە خوا ئەگەر لەبەر دوو ئایەت لەقورئاندا نەبوایە - واتە ئایەتی سەدو پەنجاونۆو سەدو شەستی سورەتی بەقەرە- هەرگیز هیچ قسەیەکم بۆ نەدەکردن /منفق علیه/ }

(١٦١) بێگومان ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕنو بە کافری دەمرن ئەوانە بەر لەعنەتی خواو فریشتەکانو هەمو خەڵك دەکەون. لەعنەت واتە دوور و بێ بەش بون لە رەحمو بەزەی پەروەردگار جا ئەو کەسەی بە کافری بمرێت دوورە لە رەحمی پەروەردگارو سەرئەنجامیش بۆ هەمیشە لە ناو ئاگردا دەمێننەوە. بزانە کە لەعنەت بەدیاریکراو (معین) لە کەس ناکرێت جگە لەو کەسەی

کە بزانین بە کافری مردوە، بەڵام بە گشتی (عام) لەعنەت دەکرێت لەوانەی کە لە قورئان یان فەرمودەکان لەعەنیان لێکراوە وەك دەڵێن: لەعنەت لە زاڵمان.

(١٦٢) ئەمێننەوە لەناو ئەو لەعنەتو نەفرینەدا کە بەرهەمی ئەو لەعنەتە سزای سەختی دۆزەخە کە ئەو سزایە لەسەریان سووك ناکرێتو ئەوانە مۆڵەتیان پێ نادرێت کە ئیسراحەت بکەنو کەمێ پشوو بدەن. ئەوەیە بەرهەمی خوا نەناسیو لاساری.

(١٦٣) خوای ئێوە یەك خوایە کە هیچ پەرەسراوێکی راستەقینەی تر نیە بێجگە لەو خوایەی کە زۆر بە سۆزە لە دنیادا بۆ هەمو مەخلوقاتی خۆی بێگیانو گیاندار، باوەڕدارو بێ باوەڕدار بەڵام ئەم سۆزە لە قیامەتدا، تایبەتە بە باوەڕدارانەوە. ئینجا لێرەدا چەند نیشانەیەك لەسەر عەزەمەتو دەسەلاتی خۆیمان بۆ باس دەکات بۆ ئەوەی کە زیاتر بیناسینو دەفەرموێ:

(١٦٤) بە راستی لە دروستکردنی ئاسمانانو زەویداو لە گۆڕاندنی شەو رۆژوکەمو زیاد کردنیان داو لەو کەشتیانەی کە هاتوچۆ دەکەن بە ناو دەریادا بۆ ئەوەی کە سوود بگەیەنێت بە خەڵكو لەوەی کە خوا رەوانەی دەکات لە ئاسمانەوە لە ئاو، ئینجا پاش ئەوە کە زەوی دەمرێتو گیاو شتی لێ وشك دەبێت سەوزی دەکاتەوەو بڵاوکردنەوەی ئەو هەمو جانەورانە لەم زەوییەداو لە گۆڕاندنی باکان کەهەر دەمێك لە لایەکەوە دێتو لەو هەورەی کە گەردن کەچە لە نێوان ئاسمانو زەویدا ئا لەمانەی کە باس کران چەندین بەڵگە هەیە لەسەر دەسەڵاتو هێزو زانایيو کار بە جێی خوای تاكو تەنیا بۆ ئەو گەلەی کە فامی شت بکەنو عەقڵ بخەنە کارەوە چونکە هیچ کەس ئەم ئیشانەی لێ نایەتو توانای هیچ کام لەو شتانەی نیە بۆ نموونە کێ دەتوانێ شەوو رۆژ بگۆڕێت؟ کێ هێزی پاڵنەری لە ناو دەریاکاندا داناوە؟ کێ باران دەبارێنێو کێ دانە دانەی دەکات؟ کێ ئەو هەمو گیان لەبەرە زۆرو جۆراو جۆرانەی دروست کردوە هیچیانی لە بیر ناچێتو رزقی هەموویشیان دەدات؟ کێ دەتوانێ باکان بگۆڕێو هەردەمێك لە لایەکەوە بیانهێنێ؟ کێ ئەو هێزە گەورەیەی بەو شتە نەبینراوە داوە کە زۆر جار بیناکان دەروخێنێت؟ وە کێ یە ئەو هەورەی بەوئاوەزۆرەوە راگرتوە لە نێوان ئاسمانو زەویداو بۆ هەر جێگایەك کە پێویست بێت رەوانەی دەکات؟ بە راستی ئا لەمانەدا بۆ مرۆڤی ژیرو زانا سەدان بەڵگە هەیە لەسەر دەسەڵاتو هێزو تەنیایی خوای گەورە بەڵام بە داخەوە زۆربەی مرۆڤ خۆی بەرەو هەڵدێر دەباتو ژیری خۆی لە دەست دەداتو لەگەڵ ئەم هەمو بەڵگە راستو دروستانە دا هاوەڵو شەریك بۆ خوای گەورە دادەنێت؟! بەڵێ ئەگەر خوای گەورە هێزێکی

إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ (١٦٤) وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَتَّخِذُ مِنْ دُونِ اللَّهِ أَنْدَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ ۖ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُوا إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ (١٦٥) إِذْ تَبَرَّأَ الَّذِينَ اتُّبِعُوا مِنَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا وَرَأَوُا الْعَذَابَ وَتَقَطَّعَتْ بِهِمُ الْأَسْبَابُ (١٦٦) وَقَالَ الَّذِينَ اتَّبَعُوا لَوْ أَنَّ لَنَا كَرَّةً فَنَتَبَرَّأَ مِنْهُمْ كَمَا تَبَرَّءُوا مِنَّا ۗ كَذَٰلِكَ يُرِيهِمُ اللَّهُ أَعْمَالَهُمْ حَسَرَاتٍ عَلَيْهِمْ ۖ وَمَا هُمْ بِخَارِجِينَ مِنَ النَّارِ (١٦٧) يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلَالًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ ۚ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ (١٦٨) إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاءِ وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ (١٦٩)

پاڵنەری دروست نەکردایە لە ناو دەریادا کەشتیەکان نەیان دەتوانی بڕۆن بە سەر دەریادا، ئەگەر ئەو پاڵنەرە بە هێزە نەبێت ئەو هەمو ئاسنە چۆن دەڕوات بە سەر ئەو دەریا گەورەو قووڵانەداو چۆن بە سەر ئاو دەکەوێت بۆ بناو نابێت؟

(١٦٥) هەندێك لە خەڵك بێجگە لە خوا چەند هاوەڵو شەریکیان داناوەو دەی پەرستن، خۆشیان دەوون هەروەك چۆن خوایان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوانەی کە باوەڕیان هەیە بە ﷲ خۆشەویستی ئەوان بۆ خودا زۆر زۆرترە لەو خۆشەویستیە کە ئەو موشریکانە هەیانە بۆ خواکانیان. خۆستەمکاران کاتێ کە بە چاوی خۆیان سزای جەهەننەم دەبینەنو دەزانن کە هەمو هێزو دەسەلات هەر هەموی بۆ ﷲ یەو کەس هیچی لە دەست نایەت، وە بەبێگومان سزای خوا زۆر سەختە. جائەوکاتە پەشیمانن لەرابوردوی خۆیان بەڵام چ سوودێکی دەبێ؟ بەڵێ ئەمە سزای ئەوانەیە کە توشی شیرکی خۆشەویستی بوون، واتە: چۆن خودایان خۆشویستوە ئاوەها جگە لە خوایان خۆشویستوە جا حاڵی ئەوانە چۆنە کە جگە لە ﷲ یان زۆرتر لە ﷲ کەسێکی تر یا شتێکی تریان خۆش ویستوە یان خۆشەویستیان هەر بۆ ﷲ نەبوە؟ دیارە کە ئەو موشریکانەی کە لەم ئایەتەدا باسیان هاتوە ئەوانەن کە خوایان خۆش دەوێت بەڵام ئەم خۆشەویستیە نابێ بە مایەی نەجاتو داخڵ بونیان لە ریزی باوەڕدارانددا بەڵکو پێویستە کە لەگەڵ ئەم خۆشەویستیەدا ئەوەی کە ﷲ پێی

خۆشەوپێی رازیە ئەویشی خۆش بوێتو پێی رازی بێتو لەو خۆشەویستیەدا کەس نەکات بە هاوەڵی اللهو خۆشەویستیەکانی تری لەبەر خواو بۆ خوا بێت نەك لەگەڵ خودا کە ئەمەیان شیرکی تەواوەو ئەوی پێشو تەواویەتی ئیمانە.

(١٦٦) جا وەبیریان بهێنەرەوە ئەو کاتەی کەسزاوتۆڵەی کردارەپیسەکانی خۆیان دەبنن سەرۆكو گەورەوتاغووتەکان بێزاری خۆیان لە ژێر دەستەکانیان دەر دەبڕنو دەڵێن، درۆ دەکەن ئێوە پەیڕەوی ئێمە نەبوون، واتە ئەوەی کە هۆی پەیوەندیان بوە لە دنیاداو ئەوانی بە یەکترەوە بەستوە لە خزمایەتی و پارەو مەقاموحیزبایەتی، هەمو دەبچڕێت نەك لە بەر ئەوەی کەیەکتر ناناسن بەڵکو لە بەر ئەوەی کە سزای قیامەت سەختەو دەترسن ئەوانیش داوای مافی خۆیانیان لێ بکەن.

(١٦٧) ئەوانەی کە تابیع بوون دەڵێن وەڵاهی ئەگەر جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ دنیا ئەوسا ئێمەش خۆمان لەوان دوور دەخەینەوەو جارێکی تر پەیڕەویان ناکەین هەروەك ئەوان ئەمڕۆ خۆیان لە ئێمە دوور خستەوەو بێزاریان لە ئێمە دەربڕیوە، بەڵێ نەزانو نەفامەکانی دنیا ئەو کاتە بیر دەکەنەوە کە تازە کار لە کار ترازاوە، هەر ئاوەها خوای گەورە پیشانیان دەدا کردارەکانیانو دەبێت بە داخو حەسرەتێکی زۆر بۆیانو هەناسەیان لە گەروویاندا پەنگ دەخواتەوەو قەپ بە لێوی خۆیاندا دەکەن، بەڵام تازە چ سوودێکی هەیە بۆیان ئەو پەشیمانیو داخو خەفەتە چونکە ئەوانە تازە نایەنە دەرەوە لە ئاگری جەهەنەمو لە ناو ئاگردا دەمێننەوە، جا ئەی هەڵخەڵەتاوان بیر کەنەوەو فریای خۆتان کەون تا لە دنیا دانو بە پەلە نەفرین بکەن لە تاغووتو پەیڕەوو ڕێبازیانو ڕێبازی پەروەردگاری خۆتان هەڵبژێرن ئەگینا دڵنیابن پەشیمان دەبنەوە لە کاتێکدا کە پەشیمان بونەوە سوودی نیە بۆتان.

بزانە: **یەکەم**- (**ند**) واتە وێنە و هاوسەنگ وە بە دژیش (**ضد**) مانا کراوەکە مانای لازمی (ند)ە.

**دووهەم**- ئەم هاوبەشیە لە خۆشەویستیو رێز لێناندایە ئەگینا هیچ کافرێك ئینکاری خالقیو رازقیەتی خوای نەکردوە.

**سێیەم**- مانای ﴿ يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ﴾ بە دوو شێوە کراوە یەکەمیان/ ئەوەبوو لە پێشەوە باسمان کرد واتە کافرەکانو موشریکەکان خوایشیان خۆش دەوێت، بەڵام قیادەو شێخو ئاغاو ئیمامو موجتەهیدو بتەکانیشیان وەك خوا خۆش دەوێت. مانای دووهەم/ واتە ئەوموشریك وبێ باوەڕانە ئەو شتانەی کە باسکران خۆشیان دەوێ هەروەك چۆن خاوەن باوەڕان خوایان خۆش دەوێت، بەڵام لە راستیدا مانای یەکەم نزیکترە چونکە ئەوان ئەو

شتانەیان هاوتای خوا کردوە لە خۆشەویستیاو لە ڕۆژی قیامەتدا دان بە هەڵەی خۆیان دا دەنێنو دەڵێن ﴿سوێند بە خوا ئێمە لەسەر لێشێوانێکی ئاشکرا دا بوین ئەوکاتەی کە ئێوەمان کرد بە هاوتای پەروەردگاری عالەم﴾ شوعەرا/٩٦ و ٩٧.

**چوارەم**- بەڵگەی راستی قسەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن: خوامان خۆش دەوێت پەیڕەوی کردنی پێغەمبەرەﷺ وەك دەفەرموێ: ﴿ئەی محمد بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێتو راست دەکەن لەو قسانەتاندا دەی پەیڕەوی من بکەن خواش ئێوەی خۆش دەوێت﴾ ئالی عیمران/٣١ واتە ئەگەر پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ نەکرا ئەو ئیدیعایە ئیدیعایەکی پووچەو خواش ئەوانی خۆش ناوێت.

**پێنجەم**- لە بارەی شەریك دانانەوە ئایەتو فەرمودەی زۆرمان هەیەو بە پشتیوانی الله هەر ئایەتێك لە جێگەی خۆیدا باس دەکەینو لە هەر جێگایەکدا بە گوێرەی پێویست فەرمودەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەهێنینو لێرەشدا تەنها ئەم فەرمودەیە دەنوسین کە دەفەرموێ: {**مَنْ مَاتَ وَهُوَ يَدْعُو مِنْ دُونِ اللهِ نِدا دَخَلَ النَّارَ وَقُلْتُ أَنا مَنْ مَاتَ وَهُوَ لَا يَدْعُو لِلهِ نِدا دَخَلَ الْجَنة** /البخاري/ هەر کەسێ بمرێو هاوتای دانابێت بۆخوادەچێتە ئاگرەوە، جامنیش وتم: خۆهەر کەسێکیش بمرێو هاوتای دا نەنابێت بۆخوا دەچێتە بەهەشتەوە }

ئیتر ئەم هاوتا دانانە چ لەپەرستن دابێت چ لەخۆشەویستی دابێت چ لەرێز لێ ناندا بێت تاوانێکی زۆر گەورەیەو مرۆڤ دەچێتە ریزی کافرانەوەو پێویستە خاوەن باوەڕان زۆر وریابنو خۆیان لەوتاوانە گەورەیە بپارێزن.

(١٦٨) ئەی خەڵکینە بخۆن ئەوەی کە لە ناو زەویدایە، ئەوەی کە حەڵاڵو پاکە واتە خواردەمەنی پێویستە هەم حەڵاڵ بێتو هەم پاك بێت، ئینجا رەوایە خواردنی، سا دوای هەنگاوەکانی شەیتان نەکەونو ڕێبازەکانی پەسەند نەکەن بە راستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە.

لێرەوە دەردەکەوێت کە ئەگەر کابرا حەرام بخوات یا خاوەن باوەڕیش نەبێت لەسەر ئەو حەرامە تۆڵەی لێ دەسەندرێت هەر چۆن لەسەر نەکردنی بەندایەتی تۆڵەی لێ دەسەندرێت بە گوێرەی ئایەتی (٤٢-٤٨) سورەتی (**ا دثر**) کە دەفەرموێ: ﴿چ شتێك ئێوەی بەرەو سەقەر پەلکێشکردوە؟لەوەڵامدا وتیان: ئێمە نوێژمان نەکردوەو خواردنمان بە فەقیر نەداوەو لەگەڵ هەوچی گەران دا هەر خەریکی هەوچی گەری بووینو باوەڕمان بە ڕۆژی قیامەت نەبو هەتا ئەو کاتەی کە مردین ئیتر شەفاعەتی شەفاعەت کەران سوودی نەبو بۆیان﴾

بەڵێ لەسەر خواردنیش حسابیان هەیە، واتە: ئەگەر موسڵمانیش نەبو دەبێ لە شتی قەدەغەو پیس بەرگری بکرێت مادام لە وڵاتی ئیسلامی دا بێت چونکە خواردنی شتی حەرام‌و پیس دەبێتە هۆی نەخۆشی‌و پێویستی بە داو دەرمان‌و دکتۆرو نەخۆشخانە هەیە. کە ئەمانە هەموی زیانێکە بۆ ماڵی گشتی (**بیت ا ال**) موسڵمانان. کەلەئەمەو وینەکانیەوە ئەم قاعیدە فیقهیە وەگیراوە کە دەڵێت: "**الضررُ يُزال**/ زیان لا دەبرێت".

(١٦٩) شەیتان ئەم سێ شتەتان پێ دەڵێت: **یەکەم**: دەڵێ خراپە بکەن: **دووهەم**: داوێن پیس بن. **سێهەم**: شتانێك بڵێن کە خوا نەیووتوە،واتە: درۆ بە دەم خواوە بکەن دەی ئیتر تاکەی ژێر نابیت؟ بۆ دەبێ دوژمنی ئەوەندەخراپ بکەیت بە دۆستی خۆت؟!

(١٧٠) هەر کاتێك پێیان بوترێت: پەیڕەوی ئەوەبکەن کە ﷲ ناردویەتی کە قورئانە دەڵێن: ئێمە پەیڕەوی ئەوەدەکەین کە باب‌و باپیرانمان پەیڕەوی بوون. باب‌و باپیرانمان چیان کردوە ئێمەش ئاوا دەکەین، ﷲدەفەرموێ: دەی ئایا شێنکەوتوی باب‌و باپیریان دەبن لەکاتێکدا باب‌و باپیریان ژیرییان لە دەست دابێ‌و هیچ فامیان نەبوبێت‌و هیدایەت نەدرابن؟

واتە بۆ پەیڕەویان دەکەن کابرا کە هیچی نەزانی بێت‌و عەقڵی بە هیچ کردارێکی باش نەشکابێت‌و لەسەر ڕێگای راست نەبوبێت؟ ئینجا ﷲوێنەیەکمان بۆ دێنێتەوە بۆ ناسینی ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕن‌و دەعوەت دەکرێن بۆ ڕێبازی خواودەفەرموێ:

(١٧١) وێنەی ئەو کەسانەی کە کافرن وەك ئەو ئاژەڵەیە کە دەنگ دەدرێت کە هیچ شتێك نافامێ لەو بانگەوازە تەنها هاتوهاوارو دەنگێك نەبێت.

مەبەست لە بیستن لێرەدا بیستنێکە کە فام کردن‌و تێگەیشتنی لەگەڵدابێت، بۆ نمونە شوان لە ئاژەڵ دەخورێت بەوشەی(ها،حا) ئاژەڵەکە تەنها دەنگێك دەبیستێت‌و شتێکی تر فام ناکات کەوابوو پێتان عەجائیب نەبێت کابرایەکی بێ دین ئەو هەمو ئایەتانەی بۆ دەخوێندرێتەوەو ئەو هەمو فەرمودانەی بۆ باس دەکرێت‌و ئەو هەمو شوێنەوارە گەورەیە دەبینێت‌و لە هەمان کاتدا باوەڕیش ناهێنێت چونکە حەقیقەت دەرك ناکات‌و هەروەك ئەو ئاژەڵە وایە بۆیە ﷲدەفەرموێ: ئەوانە کەڕن، لاڵن، کوێرن واتە نە گوێیان هەیەبۆ بیستنی حەق‌و نە زمانیان هەیە کە قسەی حەقی لێ بێتە دەرەوەو نە چاویان هەیە ئەو هەمو شوێنەوارە گرنگانەی پێ ببینن جا ئەوان فامی هیچ ناکەن. کەواتە چاوەڕێی چییان لێ دەکەیت؟ ئەمەت بەلاوە سەیر نەبێت وەك لە سورەتی حەج دا دەفەرموێ:﴿چاوی سەریان کوێر نەبووە، بەڵام ئەوچاوەی کە لە ناو دڵیان دایە کوێرەوراستی نابینێ﴾. جا لە ئایەتی پێشوو بە

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَآ أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۗ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾ وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ كَمَثَلِ ٱلَّذِى يَنْعِقُ بِمَا لَا يَسْمَعُ إِلَّا دُعَآءً وَنِدَآءً ۚ صُمٌّۢ بُكْمٌ عُمْىٌ فَهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٧١﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ وَٱشْكُرُواْ لِلَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١٧٢﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ بِهِۦ لِغَيْرِ ٱللَّهِ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ وَيَشْتَرُونَ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۙ أُوْلَـٰٓئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ إِلَّا ٱلنَّارَ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٤﴾ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱشْتَرَوُاْ ٱلضَّلَـٰلَةَ بِٱلْهُدَىٰ وَٱلْعَذَابَ بِٱلْمَغْفِرَةِ ۚ فَمَآ أَصْبَرَهُمْ عَلَى ٱلنَّارِ ﴿١٧٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ نَزَّلَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُواْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ لَفِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿١٧٦﴾

گشتی داوای لە خەڵك کرد لە شتی پاك‌و حەڵاڵ بخۆن‌و لەم ئایەتەدا بە خاوەن باوەڕان دەفەرموێ:

(١٧٢) ئەی خاوەن باوەڕان لەو پاکانەی کە ئێمە پێمان داون بخۆن وشوکری خوا بکەن ئەگەر ئێوە بە راستی تەنها ئەو دەپەرستن.

پێغەمبەرمان ﷺ لەم بارەوە دەفەرموێ: {**أيهَا الناسُ إن اللهَ طَيبٌ لَا يَقْبلُ إلا طَيبًا وَإن اللهَ أَمرَ الْمُؤمِنِيَن بِمَا أَمرَ بِهِ الْمُرْسَلِيَن فَقَالَ يَا أيهَا الرسُلُ كُلُوا مِنْ الطيبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إني بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ وَقَالَ يَا أيهَا الذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ثُم ذَكَرَ الرجُلَ يُطِيلُ السفَرَ أَشْعَثَ أَغْبَرَ يَمُد يَدَيْهِ إلَى السمَاءِ يَا رَب يَا رَب وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ فَأَنى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ**/مسلم وغ ه/ ئەی خەڵکینە بێگومان کە خوا پاکەو هەر پاکیش وەردەگرێت‌و خوا فەرمان دەدات بەسەر باوەڕدارانداا هەر بەو فەرمانەی کەداوێتی بەسەر پێغەمبەراندا علیهم السلام کە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەران لەشتەپاکەکان بخۆن‌و کرداری چاك بکەن، بێشك کە من زانیاری زۆرم هەیە بەسەر ئەوەی کەئێوە دەیکەن‌و دەفەرموێ: ئەی باوەڕداران لەو پاکانەی کەپێمان داون بخۆن، لە پاشان باسی ئەو پیاوەی کرد کەسەفەری درێژ دەکات‌و موەکانی پەرتو بڵاوەو تۆزاوییەو دەستی بەرەو ئاسمان درێژ دەکاتەوەو- دەڵێ - ئەی پەروەردگارم، ئەی پەروەردگارم لەحاڵێکدا کەخواردنەکەی حەرامەو خواردنەوەکەی حەرامەو پۆشاکەکەی حەرامەو بەحەرامی گۆشبوە سا ئیتر چۆن وەڵامی ئەوپاڕانەوەی

دەدرێتەوە؟}کەواتە ئەو کەسەی کەخۆی خۆش دەوێت و حەزدەکات نزاکانی وەربگیرێت باخۆی لە حەرام بپارێزێت.

(١٧٣) هەر ئەم چەند شتە حەرام کراوە: مردار بوو، ئەو خوێنەی کە جاری دەبێتو نە ئەو خوێنەی کە بە گۆشتەوە دەمێنێتەوە کە ئەمەیان حەڵاڵە و پیس نیە،وە گۆشتی بەرازو ئەوەی کە کاتی سەر برین ناوی جگە لەاللهی لەسەر ببرێت کە ئەمانە حەرامنو نابێ بخورێن، ئاشکرایە کە خوای گەورە ئاگای لە وەزعی مرۆڤ هەیەو دەزانێت کە مرۆڤ لە هەمو حاڵەتێکدا وەکو یەك نیە هەندێك جار دەکەوێتە فەرەحیەوەو هەندێك جاریش دەکەوێتە تەنگانەوە اللهلە هەمو قۆناغێکی ژیاندا بەرنامەیەکی تایبەتی هەیە ئەگەر لە حاڵەتی فەرەحیا بێت ئەبێ خواردنی پاكو خاوێن بخواتو نابێت هیچ کام لەوانەی کە باس کران بخورێن، بەڵام ئەگەر کەوتنە کاتی تەنگانەو برسێتیەوە ئەو کاتە دەفەرموێ: ئەو کەسەی ناچار کرا بە هۆی سەفەر یان برسی بوو شتی دەست نەکەوت مادام خۆی قەسدی حەرام نەکاتو مەبەستی حەرامخواردن نەبێتو لە سنوری پێویست تێنەپەڕێ ئەو سا هیچ گوناهی ناگات هەر کام لەوانەی دەست کەوت بخوات، مانایەکی تری ئەمەیە مادام لەو کاتەی کە ئەوەندە ناچارە ستەم کارو دەست درێژکەر نەبێت بەڵام ئەگەر کابرا بۆ سەفەری حەرام یان ئیشی حەرام بڕوات ئەگەر برسیشی بێت نابێ بیخوات یان دەست درێژی کەربو لەو حاڵەتەدا برسێتی زۆری بۆ هێنا، نابێ بیخوات. بۆیە بە ناچاران ماوە دراوە چونکە بە ڕاستی خوای گەورە خوایەکی لێبوردەومیهرەبانە بەرامبەر بە مرۆڤەکان. ئەوەتا کاتێ کە مرۆڤ کەوتە نارەحەتیەوە خوا ئەو شتانەی کە لێی حەرام کردووە بۆی حەڵاڵ دەکات.

ئەگەر وترا دیارە ئەوەی کە خوای گەورە لێی قەدەغە کردوین زیانی هەیە بۆمان دەی لەم حاڵەتەدا زیانەکە چی لێ دێت؟

دەڵێین: زیانو قازانج بە دەست خوا خۆیەتیو نایەڵێ ئەو شتە لەو حاڵەتەدا زیان بگەیەنێت چونکە تەنها خوایە زیانو قازانج دەگەینێ(والله اعلم)، یان ئەو زیانە لەریزی ئەگەرو لەوانەیە بەڵام زیانی برسێتی ئەم کاتە بێگومانە لەبەر ئەوە ئەم لایەنە پێش دەخرێت لەم کاتەداو لەکاتی فەرەحیشدا ئەولایەنەکەی ترپێش دەخرێت لەسەر ئەمەش ئەم بناغە فیقهیە دروسبوە کەدەڵێ: (**الضَّرُورَاتُ تُبِيحُ الْمَحْظُورَاتِ**/ ناچارییەکان قەدەغە کراوەکان حەڵاڵ دەکەن) وە هەر لە ڕۆشنایی ئەم ئایەتەو وێنەکانی ئەم بناغە فیقهیەی تر دانراوە (**الضَّرُورَاتُ تُقَدَّرُ بِقَدَرِهَا**/ ناچارییەکان بەئەندازەی خۆیانی بۆ دادەنرێت).

(١٧٤) بێگومانەی ئەوکەسانەی کە ئەوەی خوا ڕەوانەی کردوە لە تەوراتو ئینجیل دا، هەروەها ئەوانەی کە ڕاستیەکانی ئەم قورئانە دەشارنەوە لە بەر بەرژەوەندیو شتی ترو بە خەڵکی ناڵێن کەبەو شاردنەوەیە دەیانەوێت بەرهەمێکی کەمی دنیایان دەست کەوێت ئەوانە لەسەر ئەو ڕاستی شاردنەوە هەر ئاگردەخۆن، وەلە ڕۆژی قیامەتیشدا خوای گەورە قسەیان لەگەڵدا ناکاتو پاکیان ناکاتەوە لە گوناهەکانیانو عەفویان ناکاتو بۆ ئەوان هەیە سزایەکی پڕ ئێشو ژان.

جا ئەو پارەو مەقامەی کەبەو ڕاستی شاردنەوە دەستیان کەوتوە هەر ئاگرێکەو دەیخەنە ناو سکی خۆیانەوە وەك لەپێشدا وتمان ئەگەر هەمو بەرهەمی دنیاش بە یەك مرۆڤ بدەن لەسەر ئەوەی تاکە حوکمێکی الله بشارێتەوە زیانی کردوە چونکە لە حەقیقەتدا بەهەرەیەکی بێ نرخو کەمە لە چاو سەختی ڕۆژی قیامەتداو ئاشکرایشە ئەوەندەشی هەرگیز پێ نادە، لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ: {**لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ** / الترمذي.صححه الالبا / ئەگەر هەمو دنیا بەئەندازەی پەڕی مێشوولەیەك لای خوا قیمەتی هەبوایە خوا قومە ئاوێکی لێ نەدەدا بە کافر).

کەواتە ئەگەر هەمو دنیای پێ بدەن تا یەك حوکمی ئیسلام بشارێتەوە زیانی بە خۆی گەیاندوە.

(١٧٥) ئەوانە کەسانێکن کە گومڕاهیان کڕیوە بە هیدایەت، هیدایەتی خۆیان ناوێت. وە سزایان کڕیوە لە جیاتی لێ خۆش بون. ئەمانە چی عەجائیب سەبرێکیان هەیە لەسەر ئاگر! بە ڕاستی ئەمە گاڵتە پێ کردنیانە،

فیترەتی مرۆڤ پێشەکی پاکەو لەسەر ئایینی خوایە، بەڵام ئەوان بە مەیلی خۆیان لە ئایین لادەدەن یان حەقیقەتیان زانیوەو لە پاشان پاشگەز دەبنەوە لە باتی عەفوو بەخشیشی خوا سزایان بۆ خۆیان هەڵبژاردوە، جا ئەی موسڵمان ئاگات لەخۆت بێو نەکەی نیشانەکانی خوا بشاریتەوە لە بەر خاتری دەستکەوتێکی دنیایی، ئەگەر بیشاریتەوە بێ شك زیانێکی گەورەت بە خۆت گەیاندوەو ڕۆژێکی پڕ مەترسی چاوەڕێت دەکات، بۆچی دەبێ خوای گەورە ئاوا تۆڵەی لێ بستێنێتەوە؟

(١٧٦) ئەم سزا سەختە لە بەر ئەوەیە چونکە الله ئەم کتێبەی بە ڕاستی ناردوە، جا چۆن دەبێت ئەو ڕاستیانە بشارنەوە؟ خۆ ئەمە شتێکی گاڵتەو گەمە نیە تا تۆ بە کەیفی خۆت لەگەڵیدا بجوڵێیتەوە. جا بە ڕاستی ئەو کەسانەی کە لەبارەی ئەم کتێبەوە ناڕێکنو دژایەتی دەکەن وان لە ناو بەدبەختیەکی دوور لە ڕاستیدا. ئینجا دوا بە دوای باسی ئەوانەی کە خراپنو کەتمی

حەق دەكەن. پاشان باسی كرداری پیاو چاكەكانمان بۆ دەكاتو دەفەرموێ:

(١٧٧) چاكە ئەوە نیە كە ئێوە روو لە رۆژهەڵاتو رۆژ ئاوا بكەن بە دەعیەو فیسبنو پەیڕەوی جولەكەو گاور بكەن و هەركامیان بە هێزبون ئێوە بەرەو ئەوان بڕۆنو هەردەم سەربەلایەكو روو بە لایەك دا بكەن بەڵام چاكەو چاكەكار ئەو كەسەیە كە باوەڕی بە خوا هێنا بێتو بە رۆژی دواییو بە فریشتەكان كە زۆرترینن لەناو عالەمداو دروستكراون لەروناكیو هەرگیز نا فەرمانی خوا ناكەن، وە باوەڕی بە پەراوی خوا هەبێت كە دواترینیان قورئانەو دان بە راستی هەمو كتێبەكانی تر دا دەنێت لە كاتی خۆیاندا، وە باوەڕی بە تەواوی پێغەمبەران هێنا بێ، تا ئێرە بیرو باوەڕە دەروونیەكان بون، بەڵام هەربەوانەكار تەواوتەواو نابێ بۆیە دەفەرموێ: وە ماڵ دەبەخشێت لەگەڵ ئەوەشدا كە ماڵەكەیشی خۆش دەوێت. واتە: كاتێك ئەو ماڵ بەخشینە ئەو سودە گەورەیەی هەیە كە ماڵێكی چاكو خۆشەویست بێت لە لای، ئینجا لە بەر رەزاو خۆشەویستی خوا ئەو ماڵەی بدات بە خزمەكانی نزیكی خۆیو بە هەتیوانو بە نەدارانو بە رێبوارانو بە ئەو كەسانەی كە داوا دەكەن، وە بۆ ئازاد كردنی گەردنەكان. ئەگەر بە چاكی تەماشا بكەین دەبینین كە هیچی نەهێڵاوەتەوە.

**یەكەم**: خزم.**دووهەم**: هەتیو. هەتیو ئەو كەسەیە كە باوكی نیەو تەمەنی نەگەیشتبێتە پانزە ساڵ یان بالغ نەبوبێت، بەڵام ئەگەر دایكی نەمابێت ئەوە هەتیو نیە. **سێهەم**: بێنەوایان.

**چوارەم**: رێبواران هەرچەندە كابرا لە شوێنی خۆی دا دەوڵەمەندیش بێت مادام لە سەفەردا پارەی پێ نەما دەبێ پارەی پێ بدرێت. **پێنجەم**: ئەو كەسانەی كە داوا دەكەن.

**شەشەم**: ئەو كەسەی كە گیرۆدە بووە كراوە بە بەندە، یان ئەسیری دەستی بێ باوەڕانە بە پارە پێویستە ئازاد بكرێت یان قەرزی خەڵكی بە لاوەیە ناتوانێ بیداتەوە وەك بەندەی لێ هاتوە دەبێ ئەوانە یارمەتی بدرێن. ئا ئەمەیە بە خێو كردنی راستەقینەی كۆمەڵایەتی (التكافل الاجتماعی)و خەم خۆریو بەدەمۆهاتنی چەوساوەو بێ كەسو بێ دەستانەوە. ئا ئەمەیە بەرنامە راستەقینەكەی خوای عالەم لەو خوایە دەپاڕێمەوە كە جارێكی تر ئەم بەرنامەیە بخاتەوە كارەوە و چاوی ئێمەیشی پێ رۆشن بكاتەوە" انە سمیع مجیب.

جارێكی تر دەگەڕێینەوە سەر ئایەتە پیرۆزەكەو پاشماوەی سیفەتی پیاو چاكان كە دەفەرموێ: جا نوێژ بە چاكی ئەنجام دەدات كە دەبێت بە هۆی توند كردنی پەیوەندی نێوان خۆیو خواو زەكات دەدات كە گرنگترین هۆی بە تیین كردنی پەیوەندی نێوان خۆیو خەڵكە، لە پێشدا باسی ماڵ بەخشینی كرد بە

۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ۖ ٱلْحُرُّ بِٱلْحُرِّ وَٱلْعَبْدُ بِٱلْعَبْدِ وَٱلْأُنثَىٰ بِٱلْأُنثَىٰ ۚ فَمَنْ عُفِىَ لَهُۥ مِنْ أَخِيهِ شَىْءٌ فَٱتِّبَاعٌۢ بِٱلْمَعْرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَٰنٍ ۗ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ ۗ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِى ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ فَمَنۢ بَدَّلَهُۥ بَعْدَمَا سَمِعَهُۥ فَإِنَّمَآ إِثْمُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يُبَدِّلُونَهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾

گشتیو لێرەدا زەكاتی دووبارە كردەوە كە بەڵگەیەكی گرنگە لەسەر ئەوەی كە بێجگە لە زەكات مافی تر هەیە لەسەر ماڵ، دیسان درێژە بە سیفەتی پیاو چاكان دەداتو دەفەرموێ: جا ئەو عەهدو پەیمانەی كە دەیدەن جێ بە جێی دەكەن. بەوشێوە خۆیان لە رەوشتی مونافقان دەپارێزن، چونكە نیشانەی مونافق ئەوەیە كە هەر عەهدو پەیمانێكی دا نایباتە سەر.

وە سیفەتێكی تریشیان ئەمەیە كە خۆگرن لە كاتی دەستكورتیو زیان لێكەوتنو شەڕدا جا ئەو كەسانەی كە رەوشتیان ئاوا بێتو ئەو سیفەتانەیان تێدا بێ خوا بەوانە دەفەرموێ: ئەوانە ئەو كەسانەن كە بە دڵو بە وتارو بە كرداریان راستیو دروستی باوەڕەكەی خۆیان سەلماندوەو ئەوانە پارێزكارن چونكە خۆیان لە شتە قەدەغە كراوەكان پاراستووەو ئیشە چاكەكانیان ئەنجام داوەو بەو شێوەیەش خۆیان لە سزای پاشە رۆژ پاراستووە.

تێبینی: **الف** ـ لەم ئایەتەوە دەركەوت كە ئیسلام بە كۆی بیرو باوەڕو وتارو كردارو رەوشت دەوترێتو نابێ لێك جیا بكرێنەوە، واتە: ئەوانەی كە تەنها گۆشەیەكی ئیسلام جێ بەجێ دەكەنو خۆیان بەلاوە راستە بە هەڵە داچوون با سرنجێك لەم ئایەتە پیرۆزە بدەنو تەماشای خۆیان بكەنو بزانن كام لەم وەسفانەیان تێدایە.

**ب** ـ پێشەكی سیفەتەكانی بە تاك باس كردووە لە (**الْمُوفُونَ**)ەوە بووە بە كۆ چونكە بۆ سەرەتاكان لەفزی (**مَنْ**) لە بەر چاو گیراوەو لە پاشدا مانای (**مَنْ**) واتە: لەفزەكەی تاكەو ماناكەی كۆیە. ئەمە

له قورئاندا به زۆری هاتووه‌و چاكی بزانه وه‌ك له‌پێشدا له‌ئایه‌تی سه‌دودوانزه‌یشدا وتمان.

ج ـ له زۆربه‌ی سیفه‌ته‌كان دا ره‌وشت وه به‌ر چاو ده‌كه‌وێت به تایبه‌ت له به‌خشینیماڵو وه‌فا به عه‌هدو خۆگری دا، پێغه‌مبه‌ریشمانﷺ فه‌رمویه‌تی: {إِنَمَا بُعِثْتُ لأُتمِمَ مَكَارِمَ الْأَخْلَاقِ/ أحمد، المستدرك، صححه الالباني/من ره‌وانه‌ نه‌كراوم مه‌گه‌ر بۆ ئه‌وه‌ی ره‌وشته به‌رزو به نرخه‌كان ته‌واو بكه‌م. وه فه‌رمویه‌تی: {الْحَيَاءُ مِنَ الإِيمَانِ/متفق عليه/ شه‌رم به‌شێكه له باوه‌ڕ}وه له‌م باره‌وه ده‌یان فه‌رموده‌ی تر هه‌یه. ئینجا خوا حوكمێكی ترمان بۆ باس ده‌كاتو ده‌فه‌رموێ:

(١٧٨) ئه‌ی باوه‌ڕداران فه‌رز كراوه له‌سه‌ر ئێوه تۆڵه سه‌ندنه‌وه له كوشتندا، ئازاد به ئازادو به‌نده به به‌نده‌و ئافره‌ت به ئافره‌ت، جا كه‌سێك هه‌ر چی چاو پۆشی لێكرا له لایه‌نی براكه‌یه‌وه، واته: خاوه‌ن كوژراو له كوشتنی كابرا ده‌ستی هه‌ڵگرت ئه‌وه به راستی ئیشێكی باشی كردووه‌و ئه‌وه‌یش كه تۆڵه‌ی خوێنه‌كه‌ی له سه‌ره ده‌بێ به جوانی ئه‌و حه‌قه بداته‌وه، ئه‌وه سووك كردنێكه له لایه‌ن خوای خۆتانه‌وه‌و سۆزێكی گرنگه سه‌باره‌ت به ئێوه، جا ئه‌گه‌ر خوێن دراو پاشان كابرا بۆی هه‌ڵكه‌وتو كوشتیه‌وه ئه‌مه تاوانێكی زۆر گه‌وره‌یه بۆیه ده‌فه‌رموێ:جا كه‌سێك ده‌ست درێژی بكات پاش ئه‌وه‌ی كه ئاشته‌وایی كرا سزایه‌كی ده‌ردناكی بۆ هه‌یه‌و دووباره ئه‌ویش قاتیله‌و ده‌كوژرێته‌وه به راستی ئه‌م تۆڵه سه‌ندنه‌وه به‌رگریه‌كی زۆر گرنگه بۆ ئارام گرتنو بۆ ژیان. بۆیه خوای گه‌وره ده‌فه‌رموێ:

(١٧٩) له تۆڵه سه‌ندنه‌وه دا ژیان هه‌یه ئه‌ی خاوه‌ن عه‌قڵان. چونكه هه‌ر كه‌س زانی ئه‌گه‌ر كه‌سێ بكوژێت ده‌كوژرێته‌وه، ئیتر جورئه‌تی پیاو كوشتن ناكات خۆی‌و خه‌ڵكیش به سه‌لامه‌تی ده‌ژین بۆیه ده‌فه‌رموێ: تا ئیتر خۆتان بپارێزن له كوشتارو تاوانی كوشتن‌و سزای سه‌ختی دنیاو دوا رۆژ.

تێبینی:

یه‌كه‌م- ئه‌م بڕیاره‌ی له باره‌ی ئازاد به ئازادو به‌نده به به‌نده‌و ئافره‌ت به ئافره‌ت به لای گه‌لێك له زانایانه‌وه هه‌ڵوه‌شاوه‌ته‌وه به ئایه‌تی ﴿أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ / المائدة: ٤٥/ گیان به گیان﴾.

دوهه‌م- موسڵمان به كافر ناكوژرێته‌وه له به‌ر ئه‌م فه‌رموده‌ی كه بوخاری بۆمان ده‌گێڕێته‌وه له عه‌لی یه‌وه كه پێغه‌مبه‌ری خواوه ﷺ فه‌رمویه‌تی: {وَلَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ/البخاري/ موسڵمان به كافر ناكوژرێته‌وه} سێهه‌م- سه‌باره‌ت به به‌نده ئه‌بو حه‌نیفه‌و گه‌لێك له زانایانی تر ده‌ڵێن: ئازاد به به‌نده ده‌كوژرێته‌وه به‌ڵام جمهور مخالیفیانه،

چواره‌م- چه‌ند كه‌س به یه‌ك كه‌س ده‌كوژرێت، واته: ئه‌گه‌ر چه‌ند كه‌س به یه‌كه‌وه زه‌لامێكیان كوشت هه‌موویان ده‌كوژرێنه‌وه.

پێنجه‌م- باوك به كوشتنی منداڵی خۆی ناكوژرێته‌وه له به‌ر ئه‌م فه‌رموده‌یه كه عومه‌ر ئه‌ڵێ: بیستم له پێغه‌مبه‌ره‌وهﷺ كه فه‌رموی: {لَا يُقْتَلُ وَالِدٌ بِوَلَدِهِ/ ا د وغ ه. صحه الالبا /باوك به كوشتنی منالی خۆی ناكوژرێته‌وه‌و}. شه‌شه‌م- زۆربه‌ی هه‌ره زۆری ئه‌حكام له سوره‌ته‌كانی مه‌دینه‌دا هاتون، به‌ڵام حوكمه‌كانی بیرو باوه‌ڕو ره‌وشتو باسی نوێژو زه‌كاتو جیهاد ئه‌م سێیانه‌ی دوایی به كورتی له سوره‌ته مه‌كه‌ییه‌كان دا به زۆری هاتوون، به داخه‌وه زۆربه‌ی زانایان كه سه‌باره‌ت به ئه‌حكام قسه‌یان كردووه یان نوسیویانه له باره‌ی بیرو باوه‌ڕو ره‌وشته‌وه شتێكی زۆر گرنگیان باس نه‌كردووه خوا لێیان خۆش بێتو له تاوانی ئێمه‌و ئه‌وانیش چاو پۆشی بكات ئه‌مه بوه به هۆی ئه‌وه كه ئه‌مڕۆ نه‌وه‌ی تازه‌مان روو بكه‌ن به‌م لاو به‌ولاداو شتێك بۆ خۆیان به ده‌ست بهێنن له نێو په‌رتووكه په‌رتو بڵاوه‌كانی زانایان دا و ئه‌مه‌ش تا رۆشن بوونه‌ی چاك‌و پاكی نه‌وه‌كانمان گێچه‌ڵو ده‌رده سه‌ری زۆرمان بۆ دروست ده‌كات هیوادارم كه برا زاناو له خوا ترسه‌كانی ئه‌م سه‌رده‌مه‌مان وه‌ك پێشه‌وایه‌كی له خوا ترس‌و باوكێكی دڵسۆز له‌گه‌ڵیان دا بجوڵێنه‌وه‌و مافیان پێ بده‌ن له گورج وگۆڵیان دا و یه‌كیان بخه‌ن‌و لێكیان مه‌ده‌ن، پێغه‌مبه‌رﷺده‌فه‌رموێ: {يَدُ ا ِ مَعَ الْجَمَاعَةِ/الترمذي، صححه الالبا / ده‌ستی خوا له‌گه‌ڵ ئه‌و كۆمه‌ڵه دایه كه له‌سه‌ر رێبازی پێغه‌مبه‌ر ﷺو یارانی بێت}له‌خوابترسن ئه‌وانه نه‌وه‌ی ئاینده‌ی ئه‌م گه‌له‌ن.

حه‌وته‌م ـ بكوژ ئیرس له‌كوژراو نابات ئه‌گه‌ر ئیرس به‌ربێ، وه‌ك پێغه‌مبه‌ر ﷺ ده‌فه‌رموێ:{لَا يَرِثُ الْقَاتِلُ/ ابوداود، صححه الالبا / بكوژ میرات نابات}.

(١٨٠) هه‌ر كام له ئێوه كاتی سه‌ره مه‌رگ ئه‌گه‌ر سه‌رووه‌تو ماڵتان بو واجبه له سه‌رتان كه وه‌سیه‌ت بكه‌ن بۆ دایك‌و باوكان‌و بۆ خزمه‌كانتان به شێوه‌یه‌كی چاك نه‌ك ئه‌و ماڵه به هه‌ندێكیان بدات و هه‌ندێكی تریان بێ به‌ش بكات ئه‌مه شتێكی پێویسته له‌سه‌ر ئه‌و كه‌سه‌ی كه خاوه‌نی ته‌قوایه، ئه‌م ئایه‌ته زۆربه‌ی زانایان پێیان وایه مه‌نسوخه به ئایه‌تی ئیرس چونكه ماف ده‌دات به خاوه‌ن مافه‌كان، وه پێغه‌مبه‌ریش ﷺ ده‌فه‌رموێ: {لَا وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ/ البخاري/وه‌سیه‌ت بۆ كه‌له‌پور به‌ر نیه} به‌لای هه‌ندێكی تره‌وه مه‌نسوخ نیه‌و دروسته وه‌سیه‌ت بكرێت بۆ باوك‌و دایك‌و خزمانێ كه ئیرس نابن به هۆیه‌ك له هۆیه‌كانی به‌رگری له ئیرس وه‌ك جیاوازی دین، واته: ماناكه‌ی له گشتیه‌وه تایبه‌ت كراوه.

فَمَنْ خَافَ مِن مُّوصٍ جَنَفًا أَوْ إِثْمًا فَأَصْلَحَ بَيْنَهُمْ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٨٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ ۚ وَأَن تَصُومُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهْرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلْقُرْءَانُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَـٰتٍ مِّنَ ٱلْهُدَىٰ وَٱلْفُرْقَانِ ۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ ۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٨٥﴾ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِى عَنِّى فَإِنِّى قَرِيبٌ ۖ أُجِيبُ دَعْوَةَ ٱلدَّاعِ إِذَا دَعَانِ ۖ فَلْيَسْتَجِيبُوا۟ لِى وَلْيُؤْمِنُوا۟ بِى لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴿١٨٦﴾

﴿١٨١﴾ ئینجا ئەگەر کەسێك کەسێك وەسیەتی کردو کەسێکی تر ئەو وەسیەتەی گۆڕی پاش ئەوەی کە بیستی تاوانبارەو کابرای وەسیەت کەر هیچ گوناهی پێ ناگات، بێگومان خوا بیسەرە بۆ هەمو قسەکانتانو زۆر زانەرە بە هەڵسوکەوتتان.

﴿١٨٢﴾ ئینجا ئەگەر کابرای وەسیەت کەر لە وەسیەتەکەی دا دادپەروەر نەبو وەسیەت لا کراو دەتوانێت دەستکاری وەسیەتەکە بکات وەك دەفەرموێ: ئەگەر کەسێك ترسا لە وەسیەت کەر کە لادات لە حەقو زوڵم بکات یان وەسیەت بۆ شتێکی گوناح بکات. بۆ نمونە بڵێت: بە ماڵی من ئارەق خانەیەك دروست بکە، یان فلانە کوڕم ئەوەندە زیاتر بدات لەوانی تر نابێ ئەو وەسیەتەی جێ بەجێ بکرێتو لەم گۆڕانکاریەدا هیچ تاوانێکی لەسەر نیە وەك دەفەرموێ:جا ئەو کابرایە ویستی بەم ئیشەی ئاشتەوایی بکات لە بەینیاندا، ئەوسا ئەو کەسە هیچ گوناهێکی لەسەر نیە، بە راستی خوای گەورە لە تاوان خۆش دەبێتو زۆر بە سۆزە بۆ بەندەکانی. ئینجا خوای گەورە حوکمێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٨٣﴾ئەی خاوەن باوەران فەرز کراوە لەسەر ئێوە رۆژو بەڵام ئەوە نەبێت کە ئەو رۆژووە تایبەت بێت لەسەر ئێوە بەڵکو فەرزمان کردوە لەسەر ئێوە هەروەك چۆن فەرز کراوە لەسەر ئوممەتانی پێش ئێوە، واتە: ئەمە شتێکی پێویستە بۆتەواوی مرۆڤ هەروەکو چۆن مرۆڤ بە بێ ئاو ناژی هەر ئاوەها مرۆڤ بە بێ رۆژوو تەندروستی تێك دەچێتو دوچاری دەیان نەخۆشی دەبێت. لە بەر ئەوە هەر کە مرۆڤ دروستبوە هەر لە سەرەتایەوە رۆژیشی لەگەڵ هاتوە ئیتر کەمو زۆری رۆژەکان بە گوێرەی سەردەمو وەقت جیاوازی هەبوە بۆ نمونە: داود(علیه السلام) لە ساڵێکدا شەش مانگ رۆژووی گرتوە واتە رۆژێ نا رۆژێ بە رۆژوو بوە بە کورتی رۆژوو دکتۆرێکی پسپۆڕو دڵسۆزە بۆ مرۆڤ، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ئومێدە بۆ ئەوەی کە ئێوە خۆتان بپارێزن لە توشبونی نەخۆشی چ نەخۆشی ئاشکرا چ نەخۆشی دەرونی، وە بۆ ئەوەی کە خۆتان بپارێزن لە ئاگری جەهەننەم چونکە ئەو کەسەی کە رۆژوو دەگرێت خوای گەورە لە تاوانەکانی پاکی دەکاتەوەو خۆی بە لوتفو کەرەمی پاداشتی دەداتەوەولەئاگری دۆزەخ دووری دەخاتەوە. ئەم رۆژووە چەند رۆژێکی ژمێرراون. دیارە ئێمە هەندێك جار لە سەفەرداینو دوچاری ئەزییەتو موشەقەت دەبین و هەندێك جاریش نەخۆش دەکەوین لەو حاڵەتانەدا خوای گەورە ئێمەی لەم بەرنامەدا لە بیر خۆی نەبردوەتەوەو دەفەرموێ:

﴿١٨٤﴾ جا هەر کەسێك لە ئێوە نەخۆش کەوت یان لە سەفەردا بو با رۆژووەکە بشکێنێو لە پاشان بەو ئەندازەیەی کە شکاندویەتی لە دواییدا رۆژوو بگرێتەوە، وەلەسەر ئەو کەسانەی کە توانایان هەیە رۆژوو بگرن با فیدیە بدەن کە ژەمەخواردنی فەقیرێکە، ئەوسا هەر کەسێك لەوەش زیاتر بدات ئەوە چاکترە بۆیو ئەگەر رۆژوویش بگرن ئەوە چاکترە بۆتان ئەگەر بزانن.

سەلەمەی کوڕێ ئەکوەع دەڵێت: {لما نزلت ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِيَ حَتى نَزَلَتْ الآيَةُ الَتِي بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا /البخاري/ لەسەلەمەوە هاتوە کەوتویەتی: لەکاتێکدا کەئەم ئایەتە دابەزی (لەسەر ئەو کەسانەی کە توانایان هەیە کە رۆژوو بگرن با فیدیە بدەن) هەر کەس مەیلی بوایە رۆژوی نەگرتایە نەیدەگرتو فیدیەی دەدا تائەم ئایەتەی پاشی دابەزیوئەم حوکمەی هەڵوەشاندەوە}

واتە: خاوەن باوەڕ خۆی سەرپشکە لە رۆژوو گرتن یان رۆژوو نەگرتنو فیدیە دانداا جا بەم مانایە حوکمەکەی هەڵوەشاوەتەوە بە ئایەتی پاش خۆی، هەندێك دەڵێن هەڵنەوەشاوەتەوە ئەوانیش بە چەند شێوەیەك مانایان کردوە کە گرنگەکانیان ئەمانەن.

یەکەم ـ ئەوانەی کە توانای رۆژوو گرتنیان هەیە بەڵام لە بەر پیری یان شیردان یان بارداری رۆژوو گرتن سەختە بۆیان دەتوانن رۆژوو نەگرن و فیدیە بدەن. {عن ابن عباس يقرأ وعلى الذين

يُطوقُونَهُ فَلَا يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ لَيْسَتْ بِمَنْسُوخَةٍ هُوَ الشَّيْخُ الكَبِيرُ وَالْمَرْأَةُ الكَبِيرَةُ لَا يَسْتَطِيعَانِ أَنْ يَصُومَا فَيُطْعِمَانِ مَكَانَ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِينًا/البخاري/ لەئیبنو عەباسەوە هاتوە کە دەیخوێندەوە ﴿لەسەر ئەو کەسانەی کە رۆژگرتن بارێکی قورسە لەسەریان‌و ناتوانن بیگرن ئەوسا لەسەر ئەوانە بۆ هەر رۆژێك خواردنی ژەمێکی فەقیربدەن﴾ جا وتی: کەئەم بڕیارە هەڵنەوەشاوەتەوە بەڵکو بریتیە لەوپیاوو ژنە پیرانەی کە ناتوانن رۆژو بگرن ئەمانە رۆژو ناگرن‌و بۆ هەر رۆژێك خواردنی ژەمێکی فەقیربدات .

دووهەم: دەڵێن لە وشەی ﴿ يُطِيقُونَهُۥ ﴾ (لا) تەرکە واتە ﴿ لا يُطِيقُونَهُۥ ﴾ جا مانای ئایەتەکە ئاوای لێدێت: ئەوانەی کە توانای رۆژوو گرتنیان نیە با رۆژوو نەگرن تەنها فیدیە بدەن کە خواردنی فەقیرێکە.

سێهەم ـ دەگونجێت ئەمە ئیشارەتێك بێت بۆ زەکاتی فیتر واتە ئەوانەی کە توانای رۆژوو گرتنیان هەیە و دەیگرن با خواردنی فەقیرێکیش بدەن کە فەرمودەی پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەم زەکاتەو چەنیەتی‌و چۆنیەتی باس کردوە بۆمان وەك لەم فەرمودەیەدا بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ: {فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ / به راستی پێغەمبەری خوا ﷺ زەکاتی سەر چاك کردنەوەی داناوە بە ساعێك واتە چوار مشتی مام ناوەندی لە خورما یان جۆ لەسەر هەمو ئازادو بەندەو نێروو مێیەك لەموسڵمانان}. جا کاتی رۆژووەکەمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٨٥) رۆژوەکە لە مانگی رەمەزان دایە، ئەو مانگەی کە قورئانی تێدا دابەزێنراوە، دەبێ بزانین کە قورئان لە مانگی رەمەزان دا رەوانە کراوە بۆ پێغەمبەرﷺ بەڵام لەو کاتەدا رۆژوو فەرز نەکراوە بەڵکو پاش کۆچی پێغەمبەرﷺ واجب بووە لەم مانگەی کە کاتی خۆی قورئانی تێدا هاتوەتە خوارەوە یەکسەر بۆ **(بیت العزة)** کە ئەو کاتە شەو بوە قورئان بە شەوی بەفەڕی ناو ئەبات ﴿ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴾ واتە قورئان تا گەیشتوەتە ئێمە بە سێ قۆناغی لە یەك جیادا هاتوە:

یەکەم ـ لە اللهەوە بۆ **(لوح ا محفوظ)** کە ئێمە لە بارەی کاتی‌و چۆنیەتی بۆ ئەو لەوحە هیچ نازانین.

دووهەم ـ لەو لەوحە بۆ ئاسمانی یەکەم بۆ (بیت العزة) ئەوە لە شەوی قەدردا بوەو یەکسەر هەموی هاتوە مەبەستی ئێرە ئەوەیە کە ئەو شەوەیش لە مانگی رەمەزان دا بوە.

سێهەم ـ لە (بیت العزە)ـەوە بۆ پێغەمبەرمانﷺ کە ماوەی بیست‌وسێ ساڵ درێژەی هەبوە کە لە سوورەتی عەلەقەوە دەستی پێکردووە بە ئایەتی دوسەدو هەشتاویەکی ئەم سورەتە واتە ﴿ وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِ... ﴾ دوای هاتوە ئەگەرچی کەمێ ناڕێکی هەیە لەسەر ئایەتی کۆتایی.

بەراستی ئەم قورئانە مایەی خۆشبەختی هەمو مرۆڤە بۆیە دەفەرموێ: رێ پیشاندەری هەمو خەڵکەو چەندین بەڵگەی ئاشکرای هەیە هەم بۆ رێنمایی‌و هەم بۆ جیا کردنەوەی راست‌و ناراست.

بەڵێ ئەم پەیامە بەرێزە لەم مانگەدا هاتوە، جا بۆ شوکرانەی ئەم نیعمەتە گەورەیەی هەر کەسێ لە ئێوە گەیشتە ئەو مانگە با رۆژو بگرێت، ئەمە ئەمرەو ئەمریش بۆ واجب بوونە کەواتە ئەم ئایەتە ئایەتی﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖ ﴾ نەسخ دەکاتەوە ئەگەر بە مانای یەکەم لێکی بدەینەوە، جا لە بەر ئەوەی کە باسی واجب بونی رۆژوی رەمەزانی کردو فەرموی: بیگرن جانەك گومان بکرێت کە نەخۆش‌و سەفەریش بەر ئەم حوکمە دەکەوێت دووبارە دەفەرموێ: جائەوکەسەی کەنەخۆش بو لەئێوە یان لە سەفەردا بو رۆژووەکەی بشکێنێت‌و لە دواییدا چەند رۆژوی شکاندوە ئەوەندە رۆژو بگرێتەوە،

به راستی ئەمە بار سووك کردنێکە بۆیە دەفەرموێ: خوای گەورە هەمیشە ئاسانی بۆ ئێوە دەوێت‌و ناڕەحەتی بۆ ئێوە ناوێت، واتە: ئەم ئاینە ئاینێکی ئاسانە، پێغەمبەری خواﷺ کاتێ کە (ئەبو موساو مەعاز) ی نارد بۆ یەمەن پێی فەرمون: {بَشِّرَا وَلَا تُعَسِّرَا وَبَشِّرَا وَلَا تُنَفِّرَا/البخاري/ ئاسانکاری بکەن‌و سەختکاری نەکەن، جا موژدە بدەن‌و خەڵك مەتارێنن} تا ئەو حەدەی کە ئیمکان بێت. بۆ نموونە ئێمە لە بەینی فتوای دوو زانا یەکێکیان ناڕەحەت بێت‌و ئەوتریان ئاسان بێت مادام هەردوو بەڵگەیان ببێت پێویستە ئاسانەکەیان هەڵبژێرین.

تێبینی: تەقلید بۆ کەسێك کە خۆی نەزان بێت دروستە بەڵام دەبێت لە زانا تەقلید بکات، بەڵام بۆ کەسێك کە زانایی هەبێت دروست نیەو نابێ بە قسەی هیچ کەسێك بکات مادام لە ئایەتی قورئان یان فەرمودەی راستی پێغەمبەر ﷺ یان ئیجماعی موسڵمانانەوە وەرنەگیرا بێت، وە نابێ بۆ ئاسانکاری بەم مەزهەب‌و بەو مەزهەبە دا بگەڕێت بۆ شتە ئاسانەکان چونکە پەیڕەوی مەزهەب بۆ زانا نە فەرزەو نە سونەتە بەڵکو حەرامە. ئیتر کەی رەوایە بۆ ئاسانکاری ئەم مەزهەب‌و ئەو مەزهەب بگەڕێت؟ بەڵکو پێویستە لە سەری لە کتێب‌و سونەت دا بەڵگە بۆ ئەرکەکانی خۆی‌و موسڵمانان بدۆزێتەوە. جا ئەگەر ئیشێك بە دوو شێوەی جیا لە یەك لەوانەوە وەردەگیرا کامیان ئاسانە ئەوە

هەڵبژێرێت، مادام بەڵگەکانیان وەکو یەك وابن لە لاوازیو لە هێز دا ئەوەیە حەقیقەتی ئایینو خوای میهرەبان ئەوەی لە ئێمە دەوێت، ئەوەبو پێغەمبەرمان ﷺ فەرموی: {ئاسانکاری بکەن و سەختگیری نەکەن...} یان کاتێ کە باسی دەستو نوێژ دەکات خوادەفەرموێ: ئەگەر ئاو نەبو تەیەموم بکەن خوای گەورە نایەوێت ئێوە نارەحەت بکاتو دەفەرموێ: لە دینا تەنگی نیەو دیسان پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إن هَذَا الدينَ مَتِينٌ فَأَوْغِلُوا فِيهِ بِرِفْقٍ/ ا د. حسنه الالبا / بە راستی ئەم ئایینە بتەوو بەهێزە دەی بە هێواشی بچنە خوارەوە تێیدا}

دەیان فەرمودەو چەندین ئایەتی تر لەم بارەوە هاتووە لەسەر ڕۆشنایی ئەم ئایەتو فەرمودانە چەندین بناغەی فیقهی دانراوە یەکێکیان ئەوەیە کە دەفەرموێ: (اُلمشقةُ تَجْلِبُ التَّيسِيرَ/ سەختی ئاسانی دێنێت) وەك لێرەدا خوای گەورە ئاماژەی بۆ ئەم مەبەستە کردوەو فەرموی: خوا هەمیشە ئاسانکاری بۆ ئێوە دەوێت نایەوێ سەختیو گرفتاریو تەنگی بۆ ئێوە دروست بکات، وە ئەو ماوەیە تەواو بکەن کە مانگی ڕەمەزانە، جا جاری وا هەیە بیستونۆ ڕۆژەو جاری واش هەیە سی ڕۆژە ئەوسا بۆ گرتنی ڕۆژوی ڕەمەزان پێویستە لە پێشەوە مانگ ببینین یا سی ڕۆژ تەواو شەعبان بکەین دوایش کە ڕەمەزانمان دەست پێ کرد پێویستە یان سی ڕۆژ تەواو بکەین یان مانگ لە شەوی سی دا ببینین چونکە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ بِيَوْمٍ وَلَا بِيَوْمَيْنِ إِلَّا أَنْ يُوَافِقَ ذَلِكَ صَوْمًا كَانَ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ صُومُوا لِرُؤْيَتِهِ وَأَفْطِرُوا لِرُؤْيَتِهِ فَإِنْ غُمَّ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلَاثِينَ ثُمَّ أَفْطِرُوا / الترمذي وغ ه. الالبا : صحح / نە بە ڕۆژێك و نە بە دوو ڕۆژ پێش مەکەون بۆگرتنی ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان مەگەر ڕێك بکەوێت لەگەڵ ڕۆژویەکدا کەبەباوی خۆی ئەو ڕۆژووەی دەگرت، ڕۆژوو بگرن بە بینینی مانگو بیشکێنن بە بینینی مانگ، جا ئەگەر هاتو بە بۆنەی هەور یان بە بۆنەی تۆزو غوبارەوە نەتان دی دەفەرموێ: سی ڕۆژ تەواو بکەن لەپاشان جەژن بکەن}

لەریوایەتی تردا دەفەرموێ: {لَا تَقَدَّمُوا الشَّهْرَ حَتَّى تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ أَوْ تَرَوْا الْهِلَالَ ثُمَّ صُومُوا وَلَا تُفْطِرُوا حَتَّى تَرَوْا الْهِلَالَ أَوْ تُكْمِلُوا الْعِدَّةَ ثَلَاثِينَ / النسائي.صحح الالبا / پێش مەکەون بۆگرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان هەتا سی ڕۆژی مانگی شەعبان تەواو نەکەن یان مانگ ببینن پاشان ڕۆژو بگرن وجەژن نەکەن هەتا مانگ نەبینن یان سی ڕۆژ تەواو دەکەن}

تێبینی: دەفەرموێ:﴿ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ ﴾: وە با ڕێزی بێ پایان بۆ خودا دابنێنو یادی خوا بکەن لەسەر ئەو نیعمەتە گەورەیەی کە ڕێنمایی کردون﴾

گەلێك لە زانایان ئەمە دەکەن بە بەڵگە لەسەر (ا اك) وتن لە جەژنی ڕەمەزاندا جا ئەگەر ئاوا ڕۆژووی ڕەمەزانمان گرتو لە پاشدا سوپاسی خوای خۆمانمان کرد ئەوە ڕاست مەبەستی ئەم ئایەتەمان پێکاوە کە دەفەرموێ: بەڵکو ئێوەش سوپاسی خوای خۆتان بکەن لەسەر ئەم ڕێنماییە بە نرخە، چونکە ئەو ئێمەی دروستکردووەو هەر ئەو دەزانێت چی باشە بۆ ئێمە. وە ئەگەر بە گوێی ڕێنماییەکانی خوای خۆمان نەکەین بە ڕاستی زیانێکی گەورەمان لە خۆمان داوە، هەر لەسەر ئەو بناغەیە کەپێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ مَنْ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ / البخاری/ئەی گەنجەکان ئەو کەسەی کە دەسەڵاتی هەیە با ژن بێنێتو هەر کەسێکیش دەسەڵاتی ژن هێنانی نیە با ڕۆژوو بگرێت چونکە ئەو ڕۆژووە مرۆڤ لاواز دەکاتو هێزی ئارەزۆاتی کەم دەکاتەوە} بۆ ئارامی گیانو تەندروستیشی زۆر بە کەڵکە بەم شێوەیە مرۆڤ بە سەر نەفسی خۆیدا زاڵ دەبێتو نایبات بەرەو فەسادو داوێن پیسی کەواتە ڕۆژوو ئەو دەرمانە بە نرخەیە کە مرۆڤ بە سەدان تاقیکاری بۆی نەئەدۆزرایەوە، هەروەها یەکێکی تر لە بەرهەمە گرنگەکانی ڕۆژوو ئەوەیە کە دوعای ڕۆژووان کاتێ کە بەرۆژوەو کاتێ کەبەربانگیش دەکاتەوە قەبوڵە.

(اليسر) واتە ئاسانی (العسر) سەختی. جا لە پاش باسی ڕۆژوو باسی دوعاو پارانەوەمان بۆ دەکات وە دەفەرموێ:

(١٨٦) ئەم ئایەتە لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا هاتە خوارەوە کە وتیان ئەی محمد خواکەمان دوورە تا بانگی بکەین یان نزیکە تا بە هێواشی قسەی لەگەڵ دا بکەین؟ ﷻفەرموی لەبارەی منەوە پرسیارت لێ دەکەن بەندەکانمو دەڵێن: خواکەمان دوورە یان نزیکە بڵێ: سا بەدڵنیاییەوە من نزیکم لێیانەوەو دوور نیم کە من وەڵامی بانگی بانگ کەر ئەدەمەوە هەر کاتێك بانگ کەن، واتە ئەو شتەی کە داوای دەکات خوای گەورە بۆی دەکات یان بە ئەندازەی ئەو شتە بەڵاو موسیبەتی لەسەر لائەبات بەو مەرجەی نەڵێت دوعام کرد بەڵام خوا جوابی نەدامەوەو ئەو پاڕانەوەش تاوانو بڕینی سیلەی ڕەحم نەبێت. هەر وەکو لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ دا هاتوە، واتە: چەند مەرجێك هەیە بۆ وەرگرتنی پاڕانەوە کە لە خوارەوە باسیان دەکەین دەی ئەگەر وەڵامی نەدراوە تاوان لە خۆمانە بۆیە دەفەرموێ: دەی ئێوەش وەڵامی من بدەنەوەو باوەڕم پێ بێنن بەڵکو ئێوەش بگەن بە کەماڵو هەمو شتێکی چاك بزانن چونکە بەباوەر بون ژیانی تێرو تەواو بۆ مرۆڤ دابین دەبێت وەك دەفەرموێ ﴿ئەی باوەڕدارینە وەڵامی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بدەنەوە هەر کاتێ کە بانگتان دەکات بۆ ئەوەی کە زیندوتان دەکاتەوە﴾ ئەنفال:٢٤. بە ڕاستی زیندوو

بونەوەی مرۆڤ لە باوەڕ هێنانێکی پاك‌و خاوێن دایە بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ،

بزانە پاڕانەوە **(الدعاء)** بەشێکی گرنگە لە بەندایەتی خوای تاك‌و تەنیاو کاکڵەی بەندایەتیەو بەڵگەی لاوازیو دەستە پاچەیی مرۆڤە سەبارەت بە زۆر شتی خۆیو نیشانەی هێزو دەسەڵاتو زانایيو بەخشندەیو سۆزی خودایە سەبارەت بە بەندەکانی و بانگیان دەکات و دەفەرموێ: ﴿داوام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە﴾ وە لەم ئایەتەی کە ماناMان کرد دەفەرموێ: ﴿من نزیکم‌و وەڵامی بانگ کەر ئەدەمەوە هەر کاتێ بانگم بکات﴾ تەنانەت الله رقیەتی لەو کەسەی کە داوای شتی لێ ناکات کە ئەمە یەکێکە لەو سیفەتە گەورانەی خودا کە لە سیفەتی بەشەر ناچێت، چونکە بەشەر بە پێچەوانەوە هەرچەند سەخیش بێت هەر پێی خۆش نیە کە داوای لێ بکرێت. پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لەم بارەیەوە دەفەرموێ: {إِنَّهُ مَنْ لَمْ يَسْأَلِ اللَّهَ تَعَالَى يَغْضَبْ عَلَيْهِ/الترمذي، صححه الالبا / بەبێگومان هەر کەسێك داوا لە خوای بەشکۆ نەکات خوا رقی لێی دەبێتەوە} پاڕانەوە دەبێ بە هۆی لابردنو پاڵ نانی بەلاو ئارام بونی دڵی مرۆڤ، جا بۆ ئەوەی سوودی باشتر لەو پاڕانەوە وەرگرین پێویستە ئەم خاڵانەی خوارەوە لە بەر چاو بگرین.

١- هەوڵدەین کەخواردنو خواردنەوەو پۆشاکمان حەڵاڵ بێت.

٢- ئەگەر گونجا روو بە قیبلە بین لە کاتی دوعا دا.

٣- هەوڵدەین کە پاڕانەوەکانمان لەو بارو دۆخو کاتانە دا بێت کە پاڕانەوەیان تێدا وەردەگیرێت وەك رۆژی جومعەو عەرەفەو رەمەزان‌و سێ بەشی ئاخیری شەوو بەر لە نوێژی بەیانیو کاتی سوجدەو کاتی باران بارین‌و بەینی بانگ‌و قامەتو کاتی بانگی مەغریب‌و کاتی بە رۆژوو بون‌و کاتی بەر بانگ کردنەوەو ئامین کردن لە کاتی خوێندنی ئامینی ئیمام داو کاتی تێکەڵاو بوونی موسڵمانان‌و بێ باوەڕان لە کاتی جیهاد داو کاتی ترس‌و کاتی دڵ نەرم بون‌و کاتی بینینی هەر رووداوێکی گرنگ‌و لە کاتی سەفەردا.

٤- بەرز کردنەوەی رووی هەردوو دەست تا راستی شان.

٥- سوپاسی خوداو ناردنی درود بۆ گیانی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە پێش‌و پاشی پاڕانەوەکەدا.

٦- دڵی ئاگا بێت‌و رواڵەتی خۆی زەبوون پیشان بدات لە کاتی پاڕانەوەدا.

٧- باوەڕی بە گیرا بونی دوعا هەبێت‌و پەلە نەکات بۆ هاتنە دی چونکە مەرج نیە دەقی داواکاریەکە بێتە دی بەڵکو یەکێکە لەم سێ شتانە.

ا لف - هاتنە دی دەقی داواکاریەکە.

ب - یان لابردنی بەڵایەکە بە ئەندازەی داواکاریەکەی.

ج - یان پاداشەکەی لە رۆژی دوای دا دەدرێتەوە، گرنگ ئەوەیە کە پاڕانەوە بێ سوود نیە.

٨- پاڕانەوەکە بۆ تاوان‌و بچڕانی خزمایەتی نەبێت.

٩- هەڵبژاردنی وشەی پڕ مانای وەك ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ﴾ [اللهم إ اسئلك العفو والعافية الدنيا والآخرة]

١٠- پاڕانەوەکە دژی خۆت‌و ماڵ‌و منداڵ نەبێت.

١١- سێ جار کردنەوەی پاڕانەوەکە.

١٢- دەست هێنان بە دەم‌و چاودا لە پاش پاڕانەوەکە.

ئەمانەی کە باسمان کرد هەموویان لە فەرمودەی سەحیح یان حەسەنی پێغەمبەری ئازیزداﷺ هاتون راستەوخۆ یان ناراستەوخۆ.

دووبارە ئەچینەوە سەر باسی رۆژوو، پێش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی کە بەرەو رووی دەچین رۆژووەوان دەبوایە بەر لە خەو نانی بخواردایەو بەر لە خەویش دەی توانی لەگەڵخێزانیدا جیماعی بکردایە جارێکیان یەکێك لە یارانی پێغەمبەر ﷺ کەناوی قەیسی کوڕی سورمەی یاریدەدەربو کە بەرۆژو بو کاتی ئێوارە کەلەئیش هاتەوە هیچیان ئامادە نەبو کەبیخوات جا تاخێزانەکەی گەڕاو شتێکی بۆ پەیدا کردو هاتەوە ئەو خەوی لێ کەوتو نیوەڕۆی ئەو رۆژە لەبرسا بێ هۆش کەوت، ئینجا ئەم باسە کرا بۆ پێغەمبەر ﷺ جا خوای گەورەو خاوەن سۆز ئەم ئایەتەی رەوانە کردو موسڵمانانی لەو ناڕەحەتیە رزگار کردو فەرموی:

(١٨٧) حەڵاڵ کرا بۆ ئێوە لەو شەوانەی کەوا بە رۆژوون لەگەڵخێزانی خۆتاندا هاوجێگا ببن کەئەوان پۆشاکن بۆ ئێوەو ئێوەش پۆشاکن بۆ ئەوان، واتە: چۆن هەمیشە مرۆڤ لیباسی خۆی لەگەڵدایەو ناتوانێت لە خۆی دوور بخاتەوە، هەروەها نەپیاوو نە ئافرەت توانای دوورە پەرێزیان نیە لە یەکتر بەڵکو داپۆشەرو چاودێرو گەرم کەرەوەو پارێزەری یەکترن وا ئەو بارە سەختەیان لەسەر لا دەبرێت چونکە ئەم دینە شتێکی پاك‌و خاوێن‌و ئاسانە، خواش خوایەکی زاناو دانایەو ئاگاداری هەڵسوو کەوتی ئێوەیە وەك دەفەرموێ: الله ئاگای لێیە کە هەندێك لە ئێوە نەفسی خۆی هەڵخەلەتاندووە خۆی پێ نەگیراوەو لەگەڵ خێزانیدا هاوجێگا بوە بەڵام سۆزی خوا گرتنیەوەوتەوبەی لێ وەرگرتن‌و چاوپۆشی لێ کردن ئەمەش بەڵگەی سۆزو لوتفی خوایە، تاوان کراوەو دەفەرموێ: من زانیم چیتان کردوە، بەڵام تەوبەتان لێ وەردەگرم‌و چاوپۆشیتان لێ دەکەم (فَاللّٰهُ مدُ)

ئینجا دەفەرموێ: دەی لەمڕۆ بەدواوە شەوانی ڕەمەزان لەگەڵ ژنەکانتاندا هاوجێ ببن با مەبەستتان بەوچونە لایەش ئەوەبێ کە خوا بۆی داناون، واتە: مەبەستتان زیاد کردنی ئوممەتی پێغەمبەرﷺو پاراستنی شەرەفو کەرامەتی خۆتو خێزانت بێت، جا ئەگەر مرۆڤ بەو بیرو رایە هاوجێگا بوو لەگەڵ خێزانیا کە حەڵاڵو هاوسەریەتیو شکانی ئارەزۆی نەفسی هەردوولایە خوای گەورەو خاوەن بەرەکەت چاکەیشی بۆ دەنووسێت؟ عەرزی پێغەمبەری خوایان ﷺ کردو وتیان: قوربان کابرا ئارەزۆاتی خۆی تەواو دەکات بۆچی عیبادەتە؟ فەرموی: {ئەگەر ئەوەی لە حەرام دا سەرف بکردایە خوا تۆڵەی لێ نەدەسەند؟ وتیان: بەڵێ. فەرموی: مادام لە حەڵاڵ دا سەرفی دەکات پاداشتی دەدرێتەوە} جا ئەگەر نیەتی وا بێت کە خوا ئەولادێکی ساڵحی بداتێ خێرەکەی زیاترەو پاداشتەکەی گەورەتر دەبێت. پاش ئەوەی کە باسی هاوسەری بۆ کردین لە شەوانی ڕەمەزان دا باسی خواردنیشمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: بخۆنو بخۆنەوە هەتا ئەو کاتەی کە هێڵی سپی لە هێڵی ڕەشتان لەبەیانیدا بۆ جیا دەبێتەوە، واتە: تا ئەو کاتەی کە نوێژی بەیانی دەبێ بابای ڕۆژوەوان بۆی هەیە بخوات، لە پاشان ڕۆژووەکەتان تەواو بکەن تا دەگەن بەشەو، جا کە شەو هات ئیتر کاتی ڕۆژوەکە نامێنێت، لێرەدا حوکمێك وەردەگیرێت مادام مرۆڤ لە شەوا تاکو بەیانی بۆی هەیە بچێتە لای خێزانەکەی خۆی مانای وایە ئەگەر ڕۆژ بویەوەو لەشی پیس بێت ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێتەوە چونکە مادام کابرا بۆی هەیە تا ئاخری کات لەگەڵ خێزانەکەی دابێت ئیتر چۆن دەتوانێت فریا بکەوێتو خۆی بشوات؟ ئینجا پاش ئەوەی تێگەیشتین کە ڕۆژوو بە (جماع) لە شەودا بەتاڵ نابێتەوە، جا باسی بەندایەتیەکی ترمان بۆ دەکات کە بە (جماع) بەتاڵ دەبێتەوە کە بریتیە لە مانەوە لە مزگەوتدا بۆ بەندایەتی (الاعتكاف): واتە خۆ بەستنەوە لە شوێنی عیبادەتدا چ مزگەوتی گەورە بێت چ مزگەوتی بچوك بێت هەندێکیش دەڵێن: کابرا دەتوانێ لە ماڵی خۆی دا بێت بەڵام ڕاست وایە کە لە مزگەوتا بێت وەك دەفەرموێ: لە کاتێکدا کە ئیعتکافتان کردوە نابێ ئێوە جیماع بکەن لەگەڵ خێزانەکانتاندا، ئەوەی کە باسکرا چەند سنورێکن خوا دایناون دەی نزیکی سنورەکان نەبنەوە هەر ئاوەها خوای گەورە نیشانەکانی خۆی باس دەکات بۆ خەڵك بەڵکو ئەوان خۆیان بپارێزن لە تاوانو لە سزای سەختی ڕۆژی دوایی. ئینجا خوای گەورە یاسایەکی تر لە یاساکانی ئیسلاممان بۆ باس دەکات وە دەفەرموێ:

(١٨٨) لە نێوانی خۆتان دا ماڵی یەکتر مەخۆن بە حەرامی، واتە: هەر چۆنێ خواردنو خواردنەوە لە ڕۆژانی ڕەمەزان دا بۆ کەسێك

أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ ٱلصِّيَامِ ٱلرَّفَثُ إِلَىٰ نِسَآئِكُمْ ۚ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ۗ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمْ كُنتُمْ تَخْتَانُونَ أَنفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنكُمْ ۖ فَٱلْـَٔـٰنَ بَـٰشِرُوهُنَّ وَٱبْتَغُوا۟ مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ ۚ وَكُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكُمُ ٱلْخَيْطُ ٱلْأَبْيَضُ مِنَ ٱلْخَيْطِ ٱلْأَسْوَدِ مِنَ ٱلْفَجْرِ ۖ ثُمَّ أَتِمُّوا۟ ٱلصِّيَامَ إِلَى ٱلَّيْلِ ۚ وَلَا تُبَـٰشِرُوهُنَّ وَأَنتُمْ عَـٰكِفُونَ فِى ٱلْمَسَـٰجِدِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ ٱللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ ءَايَـٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ (١٨٧) وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ وَتُدْلُوا۟ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا۟ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ (١٨٨) ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ۗ وَلَيْسَ ٱلْبِرُّ بِأَن تَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِن ظُهُورِهَا وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنِ ٱتَّقَىٰ ۗ وَأْتُوا۟ ٱلْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَٰبِهَا ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٨٩) وَقَـٰتِلُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ (١٩٠)

کە بەهانەی شەرعی نەبێت قەدەغەیەو حەرامە، هەروەها خواردنی ماڵی یەکتری بەناڕەوا قەدەغەیەو حەرامە ئیتر ئەو ماڵ خواردنە بە ستەمو دزیو خیانەتو تاڵان بێت یان لە ڕێگەی قومارو گۆرانیو پارەی ئارەقو جگەرەو بەرازو سینەماو شتی تر لەم بابەتانە بێت با خاوەن ماڵ بەوەش ڕازی بێت هەر حەرامە یان با حاکمیش بیداتێ هەر حەرامە وەکو دەفەرموێ: وە بەو ماڵە خۆتان مەگەیەننە فەرمانڕەوایان تا هەندێ لە ماڵی خەڵك بخۆن، واتە: بەرتیل مەدەن بۆ بەدەست هێنانی ماڵی خەڵك لەڕێگای فەرمانڕەوایانەوە، حوکمی حاکم ماڵی کەس بۆ کەس حەڵاڵ ناکاتو کابرا کە زانی مافی خۆی نیە با وازی لێ بهێنێت، لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ ئەم مانایەی ڕۆشن کردوەتەوە بۆمانو دەفەرموێ: {من بەشەرمو ئێوە لە بارەی ناکۆکیەکانتانەوە دێنە لامو مومکینە هەندێکتان قسە زانتر بن لە هەندێکی ترتانو من حەق بەو بدەم بەڵام ئەگەر ئەو کەسەی کە من حەقەکەم پێ داوە خۆی دەزانێ مافی خۆی نیە با وەری نەگرێت من پارچەیەك ئاگرم بۆ بچڕیوە} واتە: حوکمی حاکم شت حەڵاڵ ناکاتو حاکم بۆی هەیە لە پاش ئیجتهاد کردن حەق بە کەسێك بدات با ڕاستیشی نەپێکا بێت، جا کاتێك کە حوکمی پێغەمبەر ﷺ ماڵ حەڵاڵ نەکات بۆ غەیری خاوەن ماڵ ئەی حوکمی کام حاکمی تر دەتوانێت حەڵاڵی بکات؟ بۆیە فەرموی نەکەن ماڵی خۆتان لە نێوان خۆتان دا بە ناحەق بخۆنو بەرزی کەنەوە بۆ لای حاکمان تا بەو بۆنەیەوە هەندێ لە ماڵی

خەڵك بخۆن بە گوناحو تاوان لەگەڵ ئەوەشدا خۆتان دەزانن كە مافی خۆتان نیەو بەو كارە تاوان بار دەبن. لەم ئایەتەدا بەرتیل دان بە حەرام دەزانرێت چونكە كابرا هەندێ بەرتیل بە حاكمو كار بە دەست دەدات تا مافی كەسێكی تری بۆ ببچڕێت. لەم بارەیەوە ئەبوهورەیرە لەپێغەمبەرمانەوەﷺ هێناویەتی كە: {لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺالرَاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ فِي الْحُكْمِ/ پێغەمبەری خوا ﷺ لەعنەتی لەو كەسە كردوە كە بەرتیل دەداتو لەو كەسەی كە وەری دەگرێت لەبڕیارو حوكمداندا}. ئینجا ﷲ لەوەڵامی پرسیاری مانگدا دەفەرموێ:

(١٨٩) پرسیارت لێدەكرێت لە بارەی مانگەوە كەمانگ چیەو لەچی دروستكراوە؟ بڵێ: ئەوە بۆیە وای لێ دەكەین تاكو خەڵك كاتەكانو حەجی پێ بزانێت، وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿ژمارەی ساڵەكانو حسابی پێ بزانن﴾ یونس /٥ واتە: كاتژمێرێكی خواییە بۆ خەڵك چونكە ئەگەر هەر یەك جۆر بوایە خەڵك ژمارەی مانگی پێ نەدەزانیو نە حەجو نە ڕۆژوو بە ڕێكو پێكیو لە كاتی خۆیان دا ئەنجام نەدەدران، ئینجا ﷲ ئامۆژگاریمان دەكاتو دەفەرموێ: ئەمە چاكە نیە كە ئێوە لە پشتەوە بچنە ناو ماڵەكانتانەوە بەڵكو چاك ئاوایە كە لە دەرگاكانیانەوە بچنە ژوورەوە، ئەمە سەرەرای ئەوە كە ئامۆژگاریەكی گرنگی تێدایە كە بۆ هەر ئیشێك پێویستە مرۆڤ لە ڕێگای خۆیەوە بۆی بچێت، هەڵوەشێنەرەوەی بۆچونو ڕەوشتێكی سەردەمی نەفامیە.دەڵێن ئەگەر لە ماڵ دەرچوونایە بۆ سەفەر چ بۆ حەج یان سەفەری تر ئەگەر سەفەرەكەیان بۆ تەواونەكرایەو بهاتنایەوە بۆ ماڵ لە دەرگاوە نەدەچونە ماڵەوە بەڵكو پشتی خانوەكانیان كون دەكردو دەچونە ژوورەوە ئەمەیان كردبو بەداب‌ونەریتێكی ئایینی خۆیان بەڵام ئیسلام هاتو ئەم جۆرە ئیشە منداڵانەیشی وەكو باقی نەریتو باوەكانی تری سەردەمی نەفامی هەڵوەشاندەوەو فەرموی: چاكە ئەوە نیە كە ئێوە لە پشتی ماڵەكانتانەوە بچنە ژوورەوە بەڵكو چاكەو چاكە كاری بریتیە لە ڕەوشتی ئەو كەسەی كە لە خوای خۆی بترسێت، جا بچنە ماڵەكانتانەوە لە دەرگاكانیانەوە لە ﷲ بترسن بەڵكو ڕزگار ببن.

(ٱلۡأَهِلَّةِ) كۆی (هلال)ـە واتە مانگی یەك شەوە،(قمر) مانگی چواردەیە لێرەشدا ئەوە وەر دەگرین كە نابێ لە غەیری دەرگاوە بچنە ماڵی كەسەوە. ئینجا ﷲ هەستی خاوەن باوەڕان دەبزوێنێتو دەستور دەدات بە موسڵمانان بۆ جیهادو دەفەرموێ:

(١٩٠) شەڕ بكەن لە ڕێگەی خوادا لە دژی ئەو كەسانەی كە شەڕتان لەگەڵدا دەكەنو لەسنوری ئایین دەرمەچنو دەست درێژ كەر مەبن بە ڕاستی ﷲمرۆڤی دەست درێژی كەری خۆش ناوێت.

یەكەم جار بڕیار درا كە شەڕ بكەن لەگەڵ ئەوانەی كە شەڕتان لەگەڵ دا دەكەن. لە ئایەتی سی‌و نۆی سورەتی (حج) دا دەفەرموێ: ﴿ئیزن درا بەو كەسانەی كە شەڕیان لەگەڵدا كرا شەڕ بكەن چونكە ستەمیان لێ كراوە﴾ لێرەدا دەستور درا بە شەڕو واجب كرا شەڕ بكەن لەگەل ئەو كەسانەی كە شەڕتان لەگەڵدا دەكەن، وە لە ئایەتێكی تردا دەفەرموێ: ﴿شەڕ بكەن لەگەڵ موشریكاندا بەگشتی وەك ئەوان شەڕ لەگەڵ ئێوەدا دەكەن بەگشتی﴾تەوبە:٣٦. وەدەفەرموێ: ﴿وە جەنگیان لەگەلدابكەن هەتا شیركو بەڵاو موسیبەت نامێنێت لە ناو موسڵمانان داو یەكسەر هەمو دێنە ناو ئایینی ئیسلامەوە كە ڕێبازی خوایە﴾ئەنفال/٣٩. بەڵێ ئەم ئایەتەی ئێرە یەكەم ئایەتە كە جیهادی فەرز كرد لەسەر موسڵمانان بەڵام ئایینی خوا دەست درێژی بە ناڕەوا دائەنێت لە هەرلایەنێك بێت، برایانم ئەمەیە ئایینی داد پەروەرو مرۆڤدۆست تەنانەت ماوە بە موسڵمان نادات كە دەست درێژیو زیادە ڕەوی بكات دژی بێ باوەڕانو كوژراوەكانیان ناشیرین بكات تەنانەت ستەم لێ كراو ئەگەر زیاتر لە مافی خۆی هەنگاوی نا دژی ستەم كار ئەوە ئەبێتەوە بە ستەم كارو ستەم كار بە ستەم لێ كراودادەنرێت. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: تاقمێك ستەمیان لێ كرا لە پاش دا خودا زاڵی كردن بە سەر ستەم كاران دا بەڵام لە سنوور دەرپەڕینو ئیشی ناڕەوایان دژی ستەم كاران ئەنجام دا لە بەر ئەوە خوا بارەكەی گۆڕیو تۆڵەی لێ سەندنەوە.زۆرجار پرسیار دەكرێت جا كاتێك كە ئێمە باوەڕدارینو دوژمنانمان بێباوەڕن دەی بۆ ئەوان زاڵ دەبن بەسەرماندا؟

ئیمامی عومەر ﷺ هەركات سوپایەكی ڕەوانەدەكرد پێیانی دەوت: (وآمرك وَمَنْ مَعَكَ أَنْ تَكُونُوا أشد إحتراساً مِنْ المَعَاصي منكم مِن عَدوكُم، فإن ذُنوبَ الجَيش أخوَفُ عَليهم مِن عَدوِهم، وَإنمَا يُنصَرُ المُسلِمونَ بِمَعصِيةِ عَدوِهِم لِلهِ، وَلولا ذَلكَ لم تَكُن لنَا بِهِم قُوة، لأن عَدَدَنا لَيسَ كَعَدَدِهِم وَلاعُدتُنا كَعُدتِهِم، فَإِنْ اسْتَوَيْنا فِي المَعْصِيَةِ كانَ لَهُمُ الفَضْلُ عَلَينا فِي القُوةِ وَلَاتقُولُوا إن عَدُونا شَر مِنا فَلَنْ يُسَلّط عَلينا، فَرُب قَومٍ سُلِّطَ عَلَيهم شر مِنهُم، كما سَلط على بَ إسرَائيل ا عملوا بِمَسَاخِطِ ا ـ كفارُ المَجوس فَجَاسُوا خِلالَ الديارِ وَكان وَعْداً مَفعولاً/ فەرماندەدەم بەسەر خۆت وئەوانەی كە لەگەڵ تۆدان كە خۆپارێزتر بن لە گوناح تا خۆپاراستن لەدوژمنەكانتان ئەوسا بەدڵنیاییەوە گوناحی سەربازەكان پڕ مەترسی ترە لەلای من تا دوژمنەكانیان، موسڵمانان هەر بە بۆنەی گوناحی دوژمنەوە یارمەتی دەدرێنو ئەگەر ئەوە نەبوایە ئێمە ئەو هێزەمان نەدەبو، چونكە نەژمارەمان بە ئەندازەی ژمارەی ئەوانەو نەسازو بەرگی جەنگیمان وەك ئەوانە، جا ئەگەر لەتاواندا هاوتا بوینەوە ئەوان لەهێزدا لەئێمە بەهێزترن جا نەڵێن:دوژمن خراپ ترن لەئێمە

وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ ثَقِفْتُمُوهُمْ وَأَخْرِجُوهُم مِّنْ حَيْثُ أَخْرَجُوكُمْ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۚ وَلَا تُقَـٰتِلُوهُمْ عِندَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ حَتَّىٰ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِيهِ ۖ فَإِن قَـٰتَلُوكُمْ فَٱقْتُلُوهُمْ ۗ كَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿١٩١﴾ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٩٢﴾ وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ ۖ فَإِنِ ٱنتَهَوْا۟ فَلَا عُدْوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٩٣﴾ ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَـٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾ وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ وَأَتِمُّوا۟ ٱلْحَجَّ وَٱلْعُمْرَةَ لِلَّهِ ۚ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۖ وَلَا تَحْلِقُوا۟ رُءُوسَكُمْ حَتَّىٰ يَبْلُغَ ٱلْهَدْىُ مَحِلَّهُۥ ۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ بِهِۦٓ أَذًى مِّن رَّأْسِهِۦ فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ ۚ فَإِذَآ أَمِنتُمْ فَمَن تَمَتَّعَ بِٱلْعُمْرَةِ إِلَى ٱلْحَجِّ فَمَا ٱسْتَيْسَرَ مِنَ ٱلْهَدْىِ ۚ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَـٰثَةِ أَيَّامٍ فِى ٱلْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ ۗ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ۗ ذَٰلِكَ لِمَن لَّمْ يَكُنْ أَهْلُهُۥ حَاضِرِى ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾

بۆیه هەرگیز زاڵ نابن بەسەر ئێمەدا، ئەوسا زۆرگەل بوون خراپتر لەخۆیانیان بەسەردا زاڵ کراوە هەروەك زاڵبو بەسەر بەنی ئیسرائیلیدا کاتێ کە ئیشیان کرد بەو جۆرەی کە خوا پێی ناخۆش بو ئاگرپەرستانی فارس کە لە ناو ماڵەکانی خۆیاندا سووكو رسوایان کردن} بوخاریش لە ئەبودەرداوە ئەم قسەیەی هێناوەکە (أيها الناس عملٌ صا ٌ قبل الغزوة، لاكِذْبَ وَلاخِيانَة /ئەی خەڵکینە کرداری چاك پێش دەستکردن بە هەر غەزایەك، نە درۆ هەبێت، نەگزی).

﴿١٩١﴾ لە هەر کوێیەکدا پێیان دەگەن لێیان بدەنو دەریان کەن لەو شوێنەی کە ئێوەیان دەرکردووەو هاوەڵ دانان بۆ خوا زۆر زۆر گەورەترە لە کوشتن، ئیسلام ئایینی ئاشتیو ئارامیە لە بەر ئەوە هەندێ کاتو هەندێ جێگای داناوە کە شەڕیان تێدا نەکرێت، لەو جێگایانە شاری مەکەیە وەك دەفەرموێ: نابێ شەڕ بکەن لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانە دا لەلای (مسجد الحرام) کەشارێکی ئەمنە چونکە ئیبراهیم وتی: خوایە ئەم شارە بکەی بە شارێکی ئەمنو ﷻ یش دوعاکەی لێ وەرگرت جا نابێت لەو جێگایەدا شەڕ بکرێت تا ئەو کاتەی کە ئەوان شەڕ دەکەن لەگەڵ ئێوەدا، جا ئەگەر ئەوان شەڕیان کرد لەو شوێنەدا ئێوەش شەڕیان لەگەڵدا بکەن هەر ئاوەهایە تۆڵەی کافران واتە مادام ئەوان رێزی ئەو جێگا پیرۆزەیان نەگرت ئێوەش تۆڵەیان لێ بکەنەوە بەلێدانیان با لەوێش دابن. فتنە بە مانای سزاو مەشغوڵ کردنو شیرك هاتوە لە قورئان دا، لێرەدا ئێمە بە شیرك مانامان کردوە هەرچەندە مەشغوڵ کەرو سزا دەری خاوەن باوەڕانیش بون.

﴿١٩٢﴾ جا ئەگەر وازیان هێناو شەڕیان نەکرد ئیتر ئێوەش شەڕ نەکەن، ئەوسا بێگومان خوا خوایەکی لێ خۆش بوو میهرەبانە. میهرەبانیو سۆزی خوا ئەوەندە زۆرە تەنانەت کافرانیش دەگرێتەوە.

﴿١٩٣﴾ جا ئەبێ ئەوەندە شەڕ بکەن لەگەڵ ئەواندا تا شەڕ کە شیرك بەشێکی هەرە گرنگی شەڕە نامێنێت جا ئەگەر وازیان هێناخۆ ئیتر دەست درێژیو شەڕ نیە مەگەر دژی ستەم کارانو موشریکان.

کەواتە ئەبێ شەڕ بکەن هەتا ئەوکاتەی کە هەر ئایینی ئیسلام بەرنامەی مرۆڤ دەبێتو هەموو جیهان دێتە ژێر سێبەری ئیسلامەوەو شەڕ کۆتایی پێدێت وەك وتراوە: "الْجِهَادُ مَاضٍ إلى يَوْمِ الْقِيَامَةِ/ جیهاد هەتا رۆژی قیامەت بەردەوامە"فەرمودەی سەحیحیش پشتی ئەم مانایە دەگرێت، ئینجا دەفەرموێ: جا ئەگەر وازیان هێنا لە دەست درێژیو ئامادەی فەرمانڕەوایی ئایینی ﷻ بوون با خۆیان بە کافری بمێننەوە ئێوە بۆتان نیە بلێن: دەبێ موسڵمان ببن لەبەر ئایەتی: ﴿ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ /البقرة: ٢٥٦ / زۆرنیە لەوەرگرتنی ئایین دا ﴾ (زالم) واتە موشریك. چونکە گەورەترین زوڵم بریتیە لە شیرك واتە تا موشریك هەبێت شەڕ هەیە. وە ئەمە سونەتی ﷲ یە کە حەقو ناحەق، ئیمانو کوفر بۆهەمیشەلە دژایەتی یەکتردابن. والله اعلم.

﴿١٩٤﴾ مانگی حەرام بە مانگی حەرامو هەمو حورمەت شکاندنێك تۆڵەی هەیە، واتە: هەر تاوانێك ئەنجام بدرێت تۆڵەی هەیە بە تایبەتی ئەو تاوانانەی کە بە ئاشکرا دەکرێن دەبێ تۆڵەی بە ئاشکرا لێ وەرگیرێت تا خەڵکی لەوتاوانانە بسڵەوێتەوە.

بەڵێ ئاپینی ئیسلام ئاینی برایەتیو ئاشتی یەو بۆ سەپاندنی ئاشتی ئاڵای جیهادی بەرز کردوەتەوەو نابێ لە بەرامبەر نەفس نزمانو دەست درێژی کەرانەوە دەستەوسان دانیشێو تەماشاکەر بێت. بۆیە ﷲدەفەرموێ: هەر کەسێ دەست درێژی کردە سەرتان ئێوەش دەست درێژی بکەنە سەری بە هەمان شێوە، ئاشکرایە بەر پەرچ دانەوەی بێ باوەڕان دەست درێژی نیە بەڵکو شتێکی جوانوپەسەندی لای هەموانە، جابە کار هێنانی وشەی (فَٱعْتَدُوا۟) بۆ هاوچەشنی(ا شاكلة) وشەی پێش خۆیەتی کەلە رەوان بێژیدا شتێکی جوانو پەسەندە.

ئینجا دەفەرموێ: لە خوا بترسن، هێنانی وشەی تەقوا لێرەدا زۆر بە تامە چونکە مرۆڤی ستەم لێکراو ئەگەر دەستی پەیدا کرد زۆر

جار له سنور تێدەپەڕێو له مافی خۆی زیاتر دەڕوات اللهترس له خۆی دەخاته بیریەوە تا له سنور تێنەپەڕێو دوچاری سزای دوارۆژوو تانەو تەشەری دنیایش نەبێتەوە، واتە: ئاینی ئیسلام پەیڕەوانی خۆی فێری لەسەر خۆییو لێ بوردنو حەوسەڵە دەکات هەر چۆنێ فێری ئازاییو نەترسیو گیان فیداییان دەکات بزانە کە زۆر ستەم لێ کراو هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا ستەم کارە چونکە بۆ نموونە ستەم لێ کراو بای دە دینار ستەمی لێ کراوە بەڵام ئەو بای سەد دینار جنێوو غەیبەتو باسی ستەم کارەکەی کردوە ئاشکرایە خوای داناو کاربەجێ دادگەرەو میزانەکەی لە زەرە کەمتریش دەخوێنێتەوەو هیچیشی لێ حەشار نادرێت.

بەڵێ بەم تەمێ کردنە جوانە مرۆڤی خاوەن باوەڕ پلەی بەرز دەبێتەوەو الله یش دەبێ بە یاریدەدەریو ڕێ پێشاندەری وەك دەفەرموێ: جا بزانن کە الله لەگەڵ پارێزکاران دایە ئاشکرایە کە جیهادو خەبات لە پێناوی خوادا پێویستی بە چەكو چۆڵەو یارمەتی هەیە بۆیە دەفەرموێ:

(١٩٥) خەرجی بکەن لە ڕێگای خواداو بە دەستی خۆتان خۆتان نەفەوتێننو چاکە بکەن بێگومان کە خوا چاکە کارانی خۆش دەوێت. واتە ئەگەر جیهادتان نەکردو ماڵتان نەدا لە ڕێگای خوادا بۆ بە هێز کردنی کارە جیهادییەکان ئەوە بە دەستی خۆتان خۆتانتان لە بەین بردوە.

ئەم ئایەتە پیرۆزە گرنگی ماڵ سەرف کردنمان پیشان دەدات بۆ بە هێز کردنی ئاینو جیهاد لەپێناوی نەهێشتنی بت پەرستیو کوفرو ستەمدا بە داخەوە هەندێك بە هەڵە مانای ئەم ئایەتە دەکەنو کاتێك کە مەسەلەی ئاینو پارێزگاری لە ئاین دێتە پێشەوە دەڵێن: بە دەستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن. بە ڕاستی ئەم ئایەتە بۆ ئەوە نەهاتوە وەك ڕیوایەتکراوە لە ئەبو ئەیوبی ئەنسارییەوە کە یەکەم کەس بو لە مەدینە دا میوانداری پێغەمبەری ﷺ کرد دەڵێت: لە شەڕی ڕۆما بوین لە شاری قوستەنتەنیە لەو کاتەدا یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ خۆی کرد بە ناو ڕێزی کافران داو شەڕی کرد تا شەهید بو هەندێك لە یارەکان وتیان: ئەوە بەدەستی خۆی خۆی خستە هیلاکەتەوە، ئەبو ئەیوبی ئەنساری گوێی لێ بو وتی: ئەم ئایەتە بە هەڵە مانا مەکەن ئەم ئایەتە بۆ ئێمە دابەزی کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی هێنا بۆ مەدینە ئێمە وازمان لە زەراعەتو شتی خۆمان هێنا هەر خەریکی جیهادو ئەنجام دانی کاری جیهاد بوین کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ سەرکەوتو خەڵکێکی زۆر باوەڕی هێناو موسڵمانو موجاهید زۆر بون ئێمەی خەڵکی مەدینە کۆبوینەوە لە بەینی خۆمان دا پرسو ڕامان بەیەکتر کرد کە با ئێمە ئیتر واز لە جیهاد بێنینو با خەریکی ماڵو زەراعەتەکەی خۆمان بین چونکە ئێستا خەڵك زۆر بوەو پێویست بە ئێمە نیە، وتی: لەم کاتەدا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرموی: ﴿نەك خەریکی زەراعەتو شت ببن نەفەقە بکەن لە ڕێگەی خوادا ئەگەر هاتو واتان نەکردو وازتان لە جیهاد هێنا ئەوە خۆتان خستۆتە هیلاکەتەوە﴾ ئا ئەوەیە مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە، جا ئەبو ئەیوبی یارمەتی دەریش لەم شەڕەدا شەهید بوو ڕەحمەتی خوای لێ بێت بۆ خۆیو زانیاریو کردارە جوانەکانی.

بەڵێ ئەو کەڵە پیاوە موجاهیدە زۆر پیر ببوو بەڵام تەمەنی هەر لە جیهاد دا بردە سەرو دەی فەرمو ناتوانم دابنیشم خوا دەفەرموێ: ﴿دەرچن بۆ جیهاد سوکتانو قورستان﴾ تەوبە:٤١ پێیان دەوت ئاخر تۆ پیری ئەی فەرمو هیچ نەبێت ژمارەی موسڵمانان زیاد دەکەمو کافرێکیش بە خۆمەوە خەریك دەکەم لە باتی ئەوەی کە گەنجێك شەهید بکات با من بکوژێت.

جا با ئێمەی موسڵمان تەماشای بیرو ڕای ئەم موسڵمانە بکەینو بزانین ئێمە لەکوێینوئەوان لەکوێن بەڵێ ئا بەم شێوەیە ئەوان دینیان گەیاندوە بە ئێمە، بەڵام بە داخەوە ئێمە چیمان کرد بەو دینەو چۆن وا بەش بەشو بچڕ بچڕمان کرد و هەر کەسێك بە گۆشەیەکیەوە مەشغوڵەو خۆیشی لە هەمو کەس پێ ڕاسترە؟! ئینجا اللهباسی یەکێکی تر لە یاسا بەرزەکانی ئیسلامان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٩٦) حەجو عومرە تەواو بکەن بۆ الله نەك بۆ ڕابواردنو کەیفو سەیرانو خۆهەڵکێشاندن، جا ئەگەر کاتێ بۆ حەجو عومرە کەوتنە ڕێو مەنع کران ئەوە ئیتر بگەڕێنەوەو چیتان بۆ هەڵ سووڕا لە حەیوان سەری ببڕنو نابێ سەرتان بتاشن هەتا ئەو حەیوانەی کە پێی دەڵێن هەدی نەگاتە جێگای خۆیو سەر نەبڕێت واتە: ئەو کەسەی کە چووە حەج تا ڕەجمی شەیتان نەکات نابێ ئەو حەیوانە سەرببڕێت بەڵام ئەگەر ڕێگای لێ گیرا لەو جێگایەدا سەری ببڕێت ئینجا سەری بتاشێت، خۆ ئەگەر کابرا دوچاری تەنگو چەڵەمە بو خۆیو حەیوانەکەی نەگەیشتنە جێگاو کاتی دیاری خۆی یان سەری بە هۆی نەتاشینەوە ئەسپێو ئازاری پەیدا کرد الله بڕیارەکە سووك دەکاتەوەو دەفەرموێ: هەر کەسێ لە ئێوە نەخۆش کەوت یان سەری ئەسپێی پەیدا کرد ناچاربو کە سەری بتاشێت ئەوە تاوانبار نابێتو ئەوە دەبێ کەفارەت بدات لە ڕۆژو یان چاکە کردن یان حەیوان سەر بڕین، بزنێك یان مەڕێك جا ئەگەر هاتو ترستان نەماو چوون بۆ حەجو حەجتان کرد کەحەجیش سێ جۆری هەیە واتە بە سێ شێوە ئەکرێت یەکێکیان پێی دەوترێت: تاك کردنەوە (الافراد) ئەوەیە کە حەج بکات لە کاتی حەجداو لە دوای دا عومرە دەکات.

جۆرێكی تری: بەیەكەوەلكان(القران)ـە كە بە یەك نیەت هەردووكیان ئەنجام دەدات.

جۆرێكی تری لەزەت وەرگرتنە (التمتع) ئەوەیە كەكابرا لە پێش حەجدا لەمانگی حەجدا عومرەیەك دەكاتو ئیسراحەت دەكاتو لیباسی عادی دەپۆشێت هەتا كاتی حەج ئینجا ئیحرام دەپۆشێو حەجەكەیشی ئەنجام دەدات، جا ئەگەر بەم دووشێوەی ئاخرە رەفتاری كرد، واتە عومرەوحەج ی بەیەكەوە ئەنجام دا یان عومرەی بەر لە حەج ئەنجام دا ئەوە پێویستە لە سەری كە بە گوێرەی توانای خۆی حەیوانێك سەر ببڕێت وەك دەفەرموێ: ئەوەی كە لە دەستی دێت لە حەیوان بزنێك یان مەڕێك جا ئەگەر كەسێك دەسەلاتی حەیوانی نەبو ئەوسا با سێ رۆژ رۆژوو بگرێت لە كاتێك كە لە حەج دایەو لە پاشان كە گەڕایەوە بۆ ناو ماڵو خاوخێزانی خۆی دەبێ حەوت رۆژ رۆژوو بگرێت كە دە رۆژی تەواو دەكات. ئەمە بۆ كەسێكە كە خەڵكی مەكە نەبێت بەلام ئەو كەسانەی كە خەڵكی مەكەو دەوروبەری بن هیچیان لەسەرنیە چونكە دەفەرموێ: ئەمە بۆ كەسێكە كەوا ئەهلەكەی لەوێ نەبێت و خەڵكی ئەوێ نەبێت،

ئینجا دەفەرموێ: لە خوا بترسن، واتە: ئەو كەسانەی كە ئەیانەوێ حەج بكەن با حەجەكەیان تەواو بێتو ماڵەكەیان حەلاڵ بێت بە پێی توانا زەحمەت بۆ خەڵك دروست نەكەن وپێویستە خەڵكی تریش لە خوا بترسێت وزەحمەت بۆ حاجیان دروست نەكاتو نەبنە پەرچ لەسەر رێگای حاجیان دا و بزانن بەبێشك كە ﷲ زۆر زۆر بە هێزە لە تۆڵە سەندنەوەدا، جا كەسانێك دەستدرێژی بكەن یان مافی حەج رعایەت نەكەن با بزانن كە بەر تۆڵەی خوا دەكەونو تۆڵەی خواش سەختو بەهێزە. ئینجا خوای گەورە كاتی حەجمان بۆ باس دەكاتو دەفەرموێ:

ٱلۡحَجُّ أَشۡهُرٞ مَّعۡلُومَٰتٞۚ فَمَن فَرَضَ فِيهِنَّ ٱلۡحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي ٱلۡحَجِّۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَتَزَوَّدُواْ فَإِنَّ خَيۡرَ ٱلزَّادِ ٱلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُونِ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿١٩٧﴾ لَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَبۡتَغُواْ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكُمۡۚ فَإِذَآ أَفَضۡتُم مِّنۡ عَرَفَٰتٖ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ عِندَ ٱلۡمَشۡعَرِ ٱلۡحَرَامِۖ وَٱذۡكُرُوهُ كَمَا هَدَىٰكُمۡ وَإِن كُنتُم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿١٩٨﴾ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٩٩﴾ فَإِذَا قَضَيۡتُم مَّنَٰسِكَكُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَذِكۡرِكُمۡ ءَابَآءَكُمۡ أَوۡ أَشَدَّ ذِكۡرٗاۗ فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنۡ خَلَٰقٖ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ حَسَنَةٗ وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ نَصِيبٞ مِّمَّا كَسَبُواْۚ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٠٢﴾

(١٩٧) حەج لە چەند مانگێكی دیاری كراو دایە بریتیە لە شەوالو زیلقەعدەو دەرۆژی سەرەتای زیلحجەئەم دوو مانگو دە رۆژە مانگی حەجن وە ئیحرامی حەجیان تێدا دەپۆشرێتو كاتی ئەنجام دانی حەج كێوی عەرەفاتو رۆژی عەرەفەیە واتە رۆژی نۆی مانگی قوربان حاجی دەبێت لەكێوی عەرەفات بێت جا ئەوكەسەی كە ئیحرامی حەجی پۆشیو حەج پێویست بو لە سەری دەبێ خۆی لە تاوان بپارێزێ وەك دەفەرموێ: جیماع لەگەڵخێزانداكردن نیەو لە سنوری ئایین دەرچون نیە. وە بەم وشەیە هەمو تاوانێك دەگرێتەوە چونكە هەمو تاوانێك دەرچونە لە سنوری خوا، ئاشكرایە كە تاوان لە هیچ كاتێكدا بۆ مرۆڤ رەوا نیە، بەلام لەو كاتەدا گوناهەكەی گەورەترەو سزاكەی سەخترە، وە دەفەرموێ: ناكۆكیو مشتومڕ نیە لە كاتی حەجدا بەڵكو پێویستە حاجیەكان بە چاكەو چاكە كاریەوە خەریك بن بۆیە دەفەرموێ: هەر ئیشێكی باش كە ئێوە ئەنجامی بدەن خوای گەورە پێی دەزانێو پێزانینی خوایش پاداشت دانەوەیەتی، ئینجا دەفەرموێ: تێشو ببەن بۆ حەجو بزانن كە باشترین تێشو بریتیە لە تەقواو لە خوا ترسانو خۆ پاراستن لە گوناح، جا لە من بترسن ئەی خاوەن عەقلان.

دەڵێن: لە پێشدا هەندێك دەچوون بۆ حەجو دەیان وت: ئێمە مێوانی خواینو خواردنو شتیان لەگەڵ خۆیاندا نەدەبردو دەیان وت: پێویستە ﷲ رزقمان بۆ بنێریت دیارە ئەوان بەم شێوەیە رەفتاریان دەبوون بە بار بە سەر خەڵكەوە بۆیە ﷲ تەمێی كردنو فەرموی: ﴿وَتَزَوَّدُواْ : تێشوو ببەن ﴾ جا ئەگەر لە رێگادا كەمو كورپیەكتان بۆ پەیدا بو انشاالله خوا پەكتان ناخات، بەڵێ ئەگەر لە خوا ترسن با خۆتان نەكەن بە بار بەسەر موسڵمانانەوە. پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: {مَنْ حَج هَذَا الْبَيْتَ فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُهُ. /ابن ماجه، صححه الالبا / هەر كەسێك حەجی ئەم ماڵە بكات، جاجیماع نەكات لەگەڵ خێزانیداو لە سنوری ئایین دەرنەچێت، ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵ وەك ئەو رۆژەی دایكی بویەتی} ئینجا ﷲ باسی كڕینو فرۆشتنمان بۆ دەكات لە كاتی حەجداو دەفەرموێ:

(١٩٨) گوناحتان ناگات ئەگەر بڕۆن لە فەزلو بەرەكەتی خوای خۆتان شتێك پەیدا بكەن، واتە كەسێك بچێت بۆ حەجو كەسابەت بكات گوناهی ناگات، مادام كەسابەتەكەی حەرام نەبێت،

به پێچەوانەی ئەوەی کە هەندێك کەس دەڵێن: کابرا نەچووە بۆ حەج بەڵکو چووە بۆ بازرگانی ئەمە قسەیەکی هەڵەیە، بەڵام ئەگەر نیەتی تەنها کەسابەت بو ئەوە پاداشتی حەجەکەی بۆ نابێت چونکە پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ: {إنمَا الأعْمَالُ بِالنيَاتِ/متفق عليه/ پاداشتی کردارەچاکەکان بەستراوە بە نیەتەکەیانەوە}. جا ئەگەر بە نیەتی حەج چووەو وتی/ لەو سەرەوەش شتێك بۆ خۆم دێنم ئەوە تاوانبار نابێت، بەڵکو ئەو جۆرە کەسابەتە یەکێکە لە حیکمەتەکانی حەجو وەڵامدانەوەی بەشێکە لە نزاکانی ئیبراهیم عليه السلام واتە بردنی کەڵو پەلی پێویستی ئەو جێگایەو کڕینو فرۆشتن، شتێکی ڕەواو چاکە لە کاتی حەجدا هەروەك چۆن لە کاتی غەیری حەج دا.

ئینجا دەفەرموێ: لە کاتێکا کە لە کێوی عەرەفات هاتنە خوارەوە، کێوەکە هەندێك لە ژوورووی مەکەوەیە کە ئەبێ ڕۆژی عەرەفە لەوێ بن تا ڕۆژ ئاوا دەبێت، وە هەر لە بەیانی ڕۆژی عەرەفەوە تا مەغریب ساتێ لەو شوێنە دا بێت ئەوە حەجەکەی دروستەو ئەگەر ئەوەندە فریا نەکەوت حەجەکەی بۆ حیساب ناکرێت.
جادوا بە دوای ئەو هاتنە خوارەوە لە لای (مەشعەر لحەرام) دا یادی خوا بکەن. مەشعەر لحەرام شوێنێکە پێی دەڵێن موزدەلیفە لە عەرەفات کە دێنە خوارەوە دێنە ئەوێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لە عەرەفات نوێژی مەغریبی دوا خستو نەی کرد تا هاتە موزدەلیفە، ئینجا لەوێ نوێژی مەغریبو عیشای بە یەکەوە بە یەك بانگو دوو قامەت کرد، ئاشکرایە کە نوێژ گەورەترین یادی خوایە، یادی خوا بکەن هەرچۆن کە ئەو ڕێنمایی کردونو کاتو جێگای بەندایەتی بۆ دیاری کردون، ئەگەر چی ئێوە لە پێشەوە لەم بارەوە لە ریزی ئەو کەسانەدا بون کە لاڕێ بون کەواتە مادام ئەمڕۆ ئێوە لە سایەی لوتفی پەروەردگارەوە ڕێگای ڕاستتان دۆزیوەتەوە پێویستە لە سەرتان سوپاسی ئەم نیعمەتە بە نرخە بکەن، ئەم قسەیە پێشەکی لە بارەی قورەیشەوەیە کە خۆیان لە خەڵك بە جیا دەزانیو لە مەشعەرولحەرامدا دەوەستانو نەدەچونە سەرەوە بۆ عەرەفات بۆیە خوا فەرمانی پێکردنو فەرموی:

(١٩٩) لە پاشدا بێنە خوارەوە لە کوێوە خەڵکی دێنە خوارەوەو خۆتان جیا مەکەنەوە لە خەڵك. واتە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هەمو مرۆڤەکان بە یەك چاو سەیر دەکاتو ماوە نادات کەس خۆی بسەپێنێت بە سەر کەسی تردا بەڵکو دەفەرموێ: داوای لێ خۆش بون بکەن لە خوا بەبێگومان خوا خوایەکی لێ خۆش بو میهرەبانە. لە ڕاستی دا ئیستغفار بۆ گوناحەچونکە بەندە لەوعیبادەتەی کە دەیکات کەمو کوڕی هەیە، جا بەو شێوەیە ئەو کەمو کوڕیانە پڕدەکرێتەوە، لەسەر ئەم ڕێنماییە پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر کات کە سەلامی نوێژی دەدایەوە سێ جار دەیفەرمو: (استغفرالله)و لە پاش نوێژ سیو سێ جار سبحان الله وە سی وسێ جار الحمدللهو سیو سێ جار الله اكبری داناوەو چەندین دوعای تر کە لە هەمو ئیستغفارەکان گەورەتر ئەمەیە: {اللهُم أنتَ رَبي لَا إلَه إلا أنتَ خَلقْتنِي وَأنا عَبْدُكَ وَأنا عَلى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتطَعْتُ أعُوذُ بِكَ مِنْ شَر مَا صَنَعْتُ أبوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلي وَأبوءُ لَكَ بِذنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإنهُ لَا يَغْفِرُ الذُنوبَ إلا أنتَ} ئەمە پێی دەوترێت گەورەی هەمو ئیستیغفارەکان( سید الاستغفار) چونکە لێرەدا کابرا ئیعتراف دەکات بە خوایەتیو دەسەڵاتو هێزی پەروەردگارو بێ هێزیو تاوانی خۆی لە ئاستی خودادواو ئەم ئیستغفارەی پاش عیبادەت، تیماری دوو نەخۆشی گرنگ دەکات

یەکەمیان: وەك لە پێشەوە وتمان تا کەمو کوڕی ئەو عیبادەتە چارەسەر بکات. دووهەمیان: تا کابرای عیبادەت کەر لە خۆی بایی نەبێتو خەرمانی کردەوەکانی خۆی نەسوتێنێتو هەست بە کەمی خۆی بکات سەبارەت بە پەروەردگاری. جا پێغەمەرمان ﷺ دەفەرموێ: {وَمَنْ قَالَهَا مِنْ النهَارِ مُوقِنًا بِهَا فَمَاتَ مِنْ يَوْمِهِ قَبْلَ أنْ يُمْسِيَ فَهُوَ مِنْ أهْلِ الجَنةِ وَمَنْ قَالَهَا مِنْ الليْلِ وَهُوَ مُوقِنٌ بِهَا فَمَاتَ قَبْلَ أنْ يُصْبِحَ فَهُوَ مِنْ أهْلِ الجَنةِ/البخاري/هەر کەسێك ئەوە بڵێ بەڕۆژ کە دڵنیابێ پێی جا لەو ڕۆژەدا پێش ئەوەی کە شەو بێت بمرێت، ئەوسا ئەوە بەهەشتیە، وەهەر کەسێك ئەوە بڵێ بەشەوو کە دڵنیابێ پێی، جا لەو شەوەدا پێش ئەوەی کەرۆژی لێ ببێتەوە بمرێت ئەوسا ئەوە بەهەشتیە}

لە دایکی باوەڕدارنەوە عایشە(خوا لێی ڕازی بێت) هاتوە کە: {كَانَ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا يَقِفُونَ بِالمُزْدَلِفَةِ وَكَانُوا يُسَمونَ الحُمْسَ وَكَانَ سَائِرُ العَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ فَلما جَاءَ الإسْلَامُ أمَرَ اللهُ عَز وَجَل نَبِيهُ ﷺ أنْ يَأتِيَ عَرَفَاتٍ فَيَقِفَ بِهَا ثُم يُفِيضَ مِنْهَا فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَز وَجَل ثُم أفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أفَاضَ الناسُ/مسلم وغ ه/ قورەیشو ئەوەی کە لەسەر ڕێچکەی ئەوان بون لەموزدەلیفە دەوەستانو پێیان دەوتن حومس، ئیتر هەمو عەرەب لە عەرەفات دەوەستان جا کاتێ کە ئیسلام هات خوای دەسەڵاتداری بەشکۆ فەرمانی کرد بە پێغەمبەرەکەی کە بچێتە عەرەفاتو لەوێدا بوەستێت، پاشان لەوێوە بێتە خوارەوە، ئا ئەوەیە مانای فەرمایشتەکەی دەسەڵاتداری بەشکۆ ﴿ ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَفَاضَ ٱلنَّاسُ.. ﴾ }

(٢٠٠) ئەوسا هەر کاتێك کە مەناسیكو پێویستیەکانی حەجتان بە جێ هێنا، جا یادی خوا بکەن هەروەکو چۆن یادی بابو باپیرانی خۆتان دەکەن.
دەڵێن لە پێش ئیسلام دا دوای ئەوەی کە حەجیان بە جێ دەهێنا هەر کەس دەهات بە شانو باڵی بابو باپیرانی خۆی داو

دەبو بە خۆهەڵکێشان، ئیسلام هات ئەو شتە بێ سودەی وەك باقی شتەکانی تر لابردو فەرموی یادی خوا بکەن وەکو ئەو یادانەتان یان لەوەش زیاتر یادی خوا بکەن وا مەزانن کەوا حەج تەواو بوە ئیتر ئیشتان تەواو بوە، نەخێر پێویستە زیاتر خۆتان بە یادی خواوە خەریك بکەنو زیاتر سوور بن لەسەر ئەنجام دانی ئیشی چاك هەروەك لە سورەتی (ئینشراح) دا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:﴿ هەر کاتێك کە تۆ لە دەعوەتو بانگەوازی کردنی خەڵك بویتەوە ئەی محمدﷺ وامەزانە کە ئیتر دەبێ ئیسراحەت بکەیت بەڵکودەبێ خۆت ماندو بکەیتو عیبادەتی زیاتر بکەیت﴾ ئەوە بو پێغەمبەرمانﷺ لە ماڵەوە ئەوەندە نوێژی کردبو ژێر پێی پیرۆزی شەق شەق ببو، ئینجا خوای گەورە کە زاناو بیسەرو بینەری نیەتو کردارەکانی ئێمەیە ئێمە دەکات بە دوو بەشەوەو دەفەرموێ: ﴿خەڵکی وا هەیە هەر داوای دنیا دەکات بۆنمونە، دەڵێ خوایە سەروەتو سامانی زۆرم پێ بدە خوایە ژیانم خۆش بکە ئاوەها دەپاڕێتەوە خوای گەورەش دەفەرموێ: بۆ ئەوانەی کە ئاوا دەڵێن لە رۆژی قیامەت دا هیچ بەشێکیان نیە چونکە ئەوان هەر دنیایان داوا کردوە ﴾.

(٢٠١) وە هەندێکی تریش لەوان هەیە کەدەڵێن:خوایە لە دنیادا چاکەمان بدەرێو لە قیامەتیش دا هەر چاکەمان بدەرێو بمان پارێزە لە ئاگر.

(٢٠٢)ئەوانە بەشێکی گەورەیان بۆهەیە لەو کارو کۆششەی کە دەیکەنو بە راستی خوای گەورە بە پەلەیە لە حیساب کردندا، واتە:زوو حیساب دەکاتو کارو کۆششی کەس بە زایە ناچێتو ئەو کەسانەی کە بەم شێوەیە دەپاڕێنەوەو داوای خێری دنیاو قیامەت دەکەن پاڕانەوەکانیان زۆر پەسەندە، چونکە بەم پاڕانەوەیان سیفەتی سەخاوەتو فراوانیو بەخشندەی خوا دەسەلمێنن هەر بۆیە زۆرترین دوعای پێغەمبەر ﷺ ئەوە بوە بە راستی نزایەکی زۆر پڕ مانایە چونکە هەمو شتێکی چاکی دنیاو هەمو شتێکی چاکی دوا رۆژ دەگرێتەوە.

إِلَيۡهِ وە یادی خوا بکەن لە چەند رۆژێکی دیاری کراودا کە سێ رۆژی پاش حەجە (ايام التشريق) وە لەو یاد کردنەوەیە قوربانی کردنو رەجمی شەیتان کردنی حاجیان لە ماوەی ئەو سێ رۆژەدا بەڵام بۆ کەسێك کە پەلەی بوو دەتوانێت لە دوو رۆژدا ئەو سێ رەجمی شەیتانە ئەنجام بدات وەك دەفەرموێ:جا کەسێك کە پەلە بکات لەو دوو رۆژەدا ئیشی ئەو سێ رۆژە ئەنجام بدات گوناهی ناگاتو کەسێکیش دوای بخاتو لەم سێ رۆژەدا تەواوی بکات گوناهی ناگات واتە بە کەیفی خۆتانە دوو رۆژ دوای حەج ئەمێننەوەیان سێ رۆژ پێغەمبەری مەزن ﷺ دەفەرموێ: {أيامُ

۞ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ فِيٓ أَيَّامٖ مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن تَعَجَّلَ فِي يَوۡمَيۡنِ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِ وَمَن تَأَخَّرَ فَلَآ إِثۡمَ عَلَيۡهِۖ لِمَنِ ٱتَّقَىٰۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ (٢٠٣) وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُعۡجِبُكَ قَوۡلُهُۥ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيُشۡهِدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلۡبِهِۦ وَهُوَ أَلَدُّ ٱلۡخِصَامِ (٢٠٤) وَإِذَا تَوَلَّىٰ سَعَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُفۡسِدَ فِيهَا وَيُهۡلِكَ ٱلۡحَرۡثَ وَٱلنَّسۡلَۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡفَسَادَ (٢٠٥) وَإِذَا قِيلَ لَهُ ٱتَّقِ ٱللَّهَ أَخَذَتۡهُ ٱلۡعِزَّةُ بِٱلۡإِثۡمِۚ فَحَسۡبُهُۥ جَهَنَّمُۖ وَلَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ (٢٠٦) وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡرِي نَفۡسَهُ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ رَءُوفُۢ بِٱلۡعِبَادِ (٢٠٧) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱدۡخُلُواْ فِي ٱلسِّلۡمِ كَآفَّةٗ وَلَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ (٢٠٨) فَإِن زَلَلۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡكُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ (٢٠٩) هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن يَأۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ فِي ظُلَلٖ مِّنَ ٱلۡغَمَامِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ (٢١٠)

التشريق أيامُ أكلٍ وَشُرْبٍ وَذِكْرٍ لِلهِ /مسلم/ ئەم رۆژانە رۆژی خواردنو خواردنەوەو یادی خودایە} بۆ ئەو کەسەی کە پارێزکار بێتو لە خوا بترسێت ئەم پاشو پێش خستنە تاوان نیەو لە خوا بترسنو بزانن بە راستی کە ئێوە لای خوا کۆدەکرێنەوە بۆ حیساب دوای ئەوەی کە مرۆڤەکان هەر یەکەو لە گۆشەیەك دا کەوتوەو لە ناو خاکدا رزیوە، لە راستیدا کۆبوونەوەی ئەمرۆی حاجیەکان لە سەرانسەری جیهان دا بێ جیاوازی لە رەنگو نەژادو زمانداو بە یەك لیباسی سادەی نەدووراو بەڵگەیەکی بچوکی ئەو کۆکردنەوە گەورەیەی رۆژی قیامەتە، بەراستی هیچ دەسەڵاتدارێك نییە لەم جیهانەدا ئاوا خەڵك لەهەمورەنگوزماندا بەبێ زۆرو بەماڵوبەکەیفی خۆیان لەجێگایەکدا کۆبکاتەوە بەڵام الله کۆیان دەکاتەوە!! ئینجا وەسفێکی تری دووروەکانمان بۆباس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٠٤)هەندێ لە خەڵك هەیە کاتێ لە بارەی دنیاوە قسە دەکەن سەرت سوڕ دەمێنێت لە جوانیو شیرینی قسەکانی بۆ نمونە دەڵێت: خەڵکی دەخەینە خۆشیەوەو مافی مرۆڤ ریعایەت دەکەین ومرۆڤ بەرەو پێشکەوتن دەبەینو وڵات ئاوەدان دەکەینەوە..و..هتد. لە عەینی کاتیشدا خوا ئاگادارە بەوەی کە لەناو دڵیدایەو قسەو دڵی وەك یەك نین یان هەمیشە لەسەر قسەکانی خوا دەگرێ بە شایەتو دەڵێ خوا شایەتە کە من ئەو قسانەی دەیکەم لە دڵمەوەیە. لەحاڵێکدا کەئەو لاسارو نەگونجاوو

شەڕەنگێزە. بەڵێ لە قسەکانی دا ئاوەهایە ئەی لە کرداری دا؟ خوا دەفەرموێ:

(٢٠٥) جا هەر کاتێك کە ریاسەت بگرێتە دەستو ببێت بە شتێكو مەسئولیەتێ بگرێتە دەست هەوڵ دەدات لەم سەر زەویەدا بۆئەوەی بێ بەندوباری تێدا بڵاو بکاتەوە هەم کێڵگەو هەم وەچەی مرۆڤ لە بەین دەبات. ئەم جۆرە مرۆڤانە کورد واتەنی "گورگنو لە پێستی مەڕدان" بە راستی ئەمانە دەمو دڵ پیسنو خراپەکارن بۆیە خوا دەفەرموێ: بە راستی خوا مرۆڤی خراپەکاری خۆش ناوێت. جائەو مرۆڤە زمان لوسو دڵ پیسو بەد کردارە دژی ئامۆژگاریشە.

(٢٠٦) هەر کاتێ پێیان بوترێت بە تایبەت کاتێ کە دەبن بە لێپرسراو ئاوەها رەفتار مەکەنو لە خوا بترسن لە باتی چاك بون زیاتر سوور دەبن لەسەر گوناحو دژایەتی ئایین. جا ئەو لووت بەرزیو تاوانکردنە لە دواڕۆژدا دوچاری سزای دۆزەخیان دەکات وەك دەفەرموێ: جابەسە بۆیان جەهەننەمو پیسترین بێشکەوئارامگایەکە بۆ ئەوان، جا با هەمو مرۆڤێکی خوا ناس تەماشای خۆی بکاتو ئاگای لەناو دەرونی خۆی بێت نەوەك لە ڕێزی ئەو تاوانبارانەدا بێتو دنیاو قیامەتی لە دەست دەرچێت، ئینجا هەروەکو باوی قورئانە کاتێ کە باسی پیاو خراپانو سزایان دەکات باسی پیاو چاکانو پاداشتیان دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٠٧) لەناو خەڵکدا پیاوی واش هەیە کە نەفسی خۆی دەفرۆشێت بە خواو لە بەر رەزامەندی خوا بێ ماندوو بونو بێ پسانەوە جیهاد دەکات لە رێگای خواداوخواش میهرەبانە سەبارەت بە بەندەکانیو کۆششو تەلاشی هیچ خاوەن باوەڕێك زایە ناکات. هەندێك دەڵێن: وشەی (یشری) بە مانای خۆیەتی، واتە: بە مانای کڕینە یەعنی نەفسی خۆی دەکڕێت بۆ خوا. وشەی (شراء) بۆ کڕینو بۆ فرۆشتن بە کار دێت. واتە: لەناو خەڵکدا پیاوی وا هەیە کە نەفسی خۆی دەکڕێت بۆ خواو خوداش میهرەبانە سەبارەت بە بەندەکانیو کۆششو تەلاشی هیچ خاوەن باوەڕێك لەناو نابات.

دەڵێن یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەرﷺ کەناوی (سوهەیبی رۆمی) بو کاتێك کەدەستوردرا هیجرەت بکرێت لەمەکەوە بۆ مەدینە یارەکان هیجرەتیان کرد سوهەیبیش هیجرەتی کرد سوهەیب کەمێك دەوڵەمەند بو لەخەڵکی مەکەو قورەیش نەبو بەڵکو خەڵکی رۆم بو بەڵام دەمێك بو هاتبوە ناو قورەیشو مەکەوە بە کەسابەتەوە خەریك بو سامانێکی باشی بە دەست هێنا بو ئینجا کە زانیان کۆچ دەکات رێگایان لێ گرتو وتیان: تۆ هاتویتە ناو ئێمەو دەوڵەمەند بویو ئێستا دەتەوێت لەگەڵ محمد ﷺ بچیت؟ ئێمە ئیجازە نادەین بچیت بۆ مەدینەو ئەو هەمو ماڵو سەروەتە ببەیتو لەگەل ئێمەدا شەڕ بکەیت ئەویش تیرو کەوانی لەسەر شانی بو دایگرت شمشێریشی پێبو وتی: خۆ ئێوە دەزانن من چەند تیر ئەندازم وڵاهی چەند تیرم پێیە یەك تیری بە خۆڕایی ناهاوێژمو تا ئەم شمشێرەیشم لە دەست دا بێت زەلامی پێ ئەکوژم جا ئیتر با بم کوژن جا هەرچی دەکەن بیکەن دڵنیا بن کە من کۆچ دەکەم وتیان: نایەڵین ماڵەکەت ببەی. وتی: ئەگەر هەمو ماڵەکەتان پێ بدەم ئیجازە دەدەن بچم؟ وتیان: بەڵێ. وتی: برۆن ماڵم لە فلانە شوێنەو هەمو شوێنەکانی پێشان دان، ئینجا ئیجازەیان دا کە کۆچ بکات بۆ لای پێغەمبەرﷺ جا هێشتا سوهەیب نەگەیشتبوە مەدینە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {رَبِحَ صُهَيْبٌ، رَبِحَ صُهَيْبٌ/ابن حبان، والبيهقي / سوهەیب قازانجی کرد سوهەیب قازانجی کرد} ئەوە بو کە سوهەیب گەیشتە جێ چەند کەسێك لەیاران چون بە پیریەوەو وتیان: موژدە بێت پێغەمبەری خواﷺ ئاوەهای فەرموە، جا دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوە دابەزیوە، لەراستیدا بۆ هەمو موجاهیدێکی راستەقینەیە تا رۆژی قیامەت.

بەڵێ پێشەوایانی ئێمە ئاوەها پارێزگاری ئەم ئایینە بە نرخەیان کردوە بۆیە بوون بە مامۆستای جیهان ئێمەیش ئاوەها وازمان لێ هێنا بۆیە بووین بە پەندی جیهان.

دەبا جارێکی تر گوێ لە بانگەوازەکانی خوا بگرینو تۆزی نەفامیونەزانی لە خۆمان بتەکێنینو ژیرانە لە فەرمانەکانی خوا ورد ببینەوەو سەر لە نوێ ئایینەکەمان بناسینەوەو جارێکی تر بەرەو ئاسۆی سەرفەرازی هەنگاوی مەردانە هەڵگرین، ئەوەتە خوا بانگمان دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٠٨) ئەی باوەڕداران بچنە ناو ئایینی ئاشتیو تەباییو سوڵحو سەفاوە کە ئایینی ئیسلامەو بە تەواوی هەمو بەشەکانی وەرگرنو پەیڕەوی هەمو فەرمانەکانی بکەن. واتە نابێ وەك ئەمڕۆی ئێمە ئیسلام وەرگرین هەندێکی ئەنجام بدەینو هەندێکی وەپاش گوێ بخەین. ئەوە بو ﷲ لە ئایەتی هەشتاوپێنجی هەمان سوورەت دا هەڕەشەی کرد لەو کەسانەی ئاوەها رەفتارێك دەکەن لەگەڵ ئایینداو دڵنیای کردین هەتا ئاوەها بین هەمیشە لە دنیادا سەر شۆڕ دەبینو لە رۆژی قیامەتیشدا سەخترین سزا چاوەڕوانمانە. دەبا بیر لە حاڵی خۆمان بکەینەوەو بەزیمان بە خۆماندا بێتەوە پەیمانێکی راستەقینە لەگەڵ خوای خۆماندا ببەستینو ئەم ماوە کەمەی تەمەنمان لە خزمەت قورئان دا ببەینە سەر تا ئەگەر لەم ژیانەدا نەژین لە ژیانەکەی تردا بەختەوەرانە بژین.

دلنیا بن ئەگەر وا بین مەردانە دەژین و مەردانەش دەمرین و رۆژێکی پاش مەرگیشمان خۆشترو چاکتر دەبێت لە هەزار ساڵ ژینمان. بە راستی ئەم کەمتەر خەمیو گوێ نەدان بە دینە پەیڕەوی کردنی شەیتانەو شەیتانیش دوژمنی دوا نەهاتوی ئێمەیەو لە فریودان و خەڵەتاندنی بەرەی ئادەمیزاد دا دەستێکی پۆلایین و بێ بەزەیی هەیە، بۆیە پەروەردگاری میهرەبان ئەوەندە باسی شەیتان دەکات و بەرەی ئادەمیزاد لەو دوژمنە ئاگادار دەکاتەوە وەك لێرەدا دەفەرموێ: ئایینی ئیسلام بە تەواوی وەرگرن و بچڕ بچڕی مەکەن کە بۆ هـــەر بەشێـــك حیزبێك دابنێن. لە خوا بترسن و دەست بە ئایینەکەی خواوە بگرن و دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون و ئاواتەکانی مەهێننە دی چونکە بەراستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە. دەی ئایا ژیرانەیە کە مرۆڤ بە گوێی دوژمنی خۆی بکات؟ ئەوە بو شەیتان کاتێ کە بە بۆنەی سوجدە نەبردنیەوە بۆ ئادەم نەفرینی لێ کرا ئەویش سوێندی خوارد کە نەیەڵێت هیچ کەسێك بە سەر رێگا راستەکەی خوادا بڕوات وتی:﴿ بە عیزەتت قەسەم هەموویان گومڕا دەکەم بێجگە لە بەندە موخلیسەکانت﴾ساد/٨٢،٨٣.

جا ئەگەر ئێمە موخلیس نەبین ئەبێ چاك بزانین کە شەیتان دەتوانێت گومڕامان بکات. موخلیسیش ئەوەیە کە ئیشەکانی خۆمان پاڵفتە بکەین بۆ خوا. بەڵگەی بەندەی راستو پاڵفتە ئەوەیە کە ئەنجام دانی بەندایەتی لە خواردنی خۆش بە خۆشتر تەماشا بکات وەکو پێغەمبەرﷺ لە کاتی تەنگانەدا ئەیفەرمو{یا بلالُ أقم الصلاة أرحْنا بها/ ابوداود، صححه الالبا / ئەی بیلال قامەت بکە بۆ نوێژو بەوە کەیف خۆشمان بکە} واتە: قامەت بکە با دەست بکەین بە نوێژو بەو نوێژە پەژارەکانمان کەم کەینەوە. بەڵێ خاوەن باوەڕی راستەقینە ئەو کەسانەن کە بەندایەتی خوای خۆیان بە لاوە لە هەمو شت شیرین ترە تەنانەت لە گیانیشیان چونکە خوای خۆیان چاك دەناسن و تەنها سەری بەندایەتی بۆ ئەو شۆڕ دەکەن وهەر لە ئەویش دەترسن جا چونکە مرۆڤ دوو دوژمنی سەرەکی هەمیشە لەگەڵدایە، یەکەم: نەفس، دووهەم: شەیتان، لەبەرئەوەزۆر هەڵەدەخلیسکێ بەڵام خوا زۆر بەخشندەیە ئەگەر پەشیمان ببێتەوە دەی بەخشێت، وەك دەفەرموێ:.

(٢٠٩) جا ئەگەر ئێوە هەڵخلیسکان و لاتان دا دوای ئەوەی کە حەقیقەتتان بۆ رۆشن کرایەوەو بەڵگەی ئاشکراتان بۆ هات دەی باش بزانن بە راستی خوا خاوەن دەسەڵاتەو تۆڵەتان لێ دەستێنێ و ئەم تۆڵە سەندنەوەش کارێکی دانایانەیە. لادان تەنها زیانی بۆ لادەر نیە بەڵکو زیان بە خەڵکی تریش دەگەیەنێت بۆیە چاو پۆشی لێ ناکرێت و تۆڵەی لێ وەردەگیرێت.

هەندێ ﴿ كَآفَّةً ﴾ بە حاڵی واوی ﴿ءَامَنُواْ ﴾ی دەزانن واتە هەموتان بچنە ناو ئایینی ئیسلامەوە وە هەندێکیشی بە حاڵی ﴿ ٱلسِّلۡمِ ﴾دا دەنێن وەك مانامان کرد هەردوو دەگونجێ و چاکەو بۆ هەردووش بەڵگە هەیە بەڵام من دووهەمیانم بە لاوە جوانترە لە بەرئەوەی کە خوا بە ناوی باوەڕدارەوە بانگمان دەکات و دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بچنە ناو ئیسلامەوە واتە هەمو خاوەن باوەڕان بانگ دەکات کە بە تەواوی بچنە ناو ئایینەوە.

هەندێك ﴿ ٱلسِّلۡمِ ﴾یان، بە مانای ئاشتی مانا کردوە ئەمە مانای لازمیەتی چونکە تەسلیم بونی تەواو بە ئایین تەسلیم بونی ئاشتیە لەگەڵ تەواوی ئەم بونەوەرەدا چونکە هەموی تەسلیم و گەردن کەچی خوای گەورەو خاوەن دەسەڵاتە وەك دەفەرموێ: ﴿ هەربۆ ئەو تەسلیم و گەردن کەچە ئەوەی کە لە ئاسمانان و زەویدایە﴾ئالی عیمران/٨٣.

هەروەها دوژمنانی ئایین هەر کاتێ ئامادەی فەرمانڕەوایی ئایین بون و وازیان لەشەڕهێنا یا باوەڕیشیان بە ئایین نەبێت خاوەن باوەڕان ئەبێ لێیان وەرگرن وەك دەفەرموێ: ﴿ئەگەر ئەوان ئامادەی ئاشتی بون تۆش باڵی بۆ راکێشە﴾ئەنفال/٦١. دوابە دوای ئەم تەسلیم بون و ترساندن لە هەڵخلیسکانی ئەم دنیایە سرنجی مرۆڤ بۆ هاتنی رۆژی دوای رادەکێشێ و دەفەرموێ:

(٢١٠) ئایا باوەڕ ناهێنن و هەر لەسەر ئەو بێ باوەڕیە دەمێننەوە تا ئەو کاتەی کە خوای گەورە لە ناو سێبەری هەورێکدا دادەبەزێ بۆ حیسابو فریشتەکانی هەر حەوت ئاسمان دێنە خوارەوە وهەمو ئیشەکان جێ بە جێ کراوە هێشتا کە قیامەت نەهاتوە ﷻ دەفەرموێ: ئیش جێ بە جێ کراو هەمو کاروبارێك روبە خوا دەکرێتەوە. هەندێ ئەم ئایەتیان بەم شێوەیە مانا کردووە، ئەم بێ باوەڕانە باوەڕ بە ئایین ناکەن و داوای بەڵگەی ئاسمانی دەکەن واتە: داوای سزا دەکەن.

بەڵام ئێمە رەئی یەکەم بە نزیکتر دەزانین لە بەر ئەو فەرمودە مەشهورەی پێغەمبەرﷺ کە خەڵك لە پاش وەستانێکی زۆر لە سەرای مەحشەردا ناچار رووەدەکەنە پێغەمبەرەکان و لە باوکەگەورەمانەوە ئادەم دەست پێ دەکەن تا دەگەنە محمد ﷺ ئا لەوێدا دەفەرموێ: {بەڵێ، من بۆ ئەوەم}، دەچێت و لە ژێر عەرشدا سوجدە دەبات بۆ خواو داوا دەکات کە خوا تەشریف بهێنێت بۆ دادگایی کردنی خەڵك خوایش داواکەی لێ وەردەگرێت و لە سێبەری هەورێکدا دادەبەزێت دوای لەتبونی ئاسمانی یەکەم و هەمو فریشتەکانی ئاسمانی یەکەم و پاشان

سَلۡ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ كَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّنۡ ءَايَةِۭ بَيِّنَةٖۗ وَمَن يُبَدِّلۡ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢١١﴾ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَيَسۡخَرُونَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۘ وَٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَٱللَّهُ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٢١٢﴾ كَانَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَبَعَثَ ٱللَّهُ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَأَنزَلَ مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ فِيمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَمَا ٱخۡتَلَفَ فِيهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ أُوتُوهُ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡبَيِّنَٰتُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۖ فَهَدَى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَا ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ مِنَ ٱلۡحَقِّ بِإِذۡنِهِۦۗ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٍ ﴿٢١٣﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَأۡتِكُم مَّثَلُ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۖ مَّسَّتۡهُمُ ٱلۡبَأۡسَآءُ وَٱلضَّرَّآءُ وَزُلۡزِلُواْ حَتَّىٰ يَقُولَ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ مَتَىٰ نَصۡرُ ٱللَّهِۗ أَلَآ إِنَّ نَصۡرَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ ﴿٢١٤﴾ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴿٢١٥﴾

دووهەمو پاشان هەر حەوتیانو هەڵگرانی عەرشو فریشتە زۆر بەرێزەکانی تر دادەبەزن بەڵام چۆنیەتیەکەی نەزانراوەو لەموتەشابیهاتەو چونە خوارەوە تێیدا بەڵگەی دڵ نەخۆشیەو لادانە لەراستە رێگای ئیسلام.

(٢١١) پرسیار بکە لە جووەکان جا دەزانیت کە ئێمە چەند بەڵگەی ئاشکرامان پێ دان وەك رووناکی دەستی موساو عەساکەیو لەتکردنی دەریاو شەق کردنی بەردو هاتنە دەرەوەی ئاو لەو بەردەو سێبەری هەور بۆ پاراستنیان لە گەرماو گەزۆو شیلاقە بۆ خواردنیان، بەڵام ئەوان سوپاسی خوایان نەکردو پەیرەوی پێغەمبەرەکەیان نەکرد بۆیە نەفرینیان لێ کراو بۆ هەمیشە کەوتنە بەر رقو قینی ﷲ ی خاوەن دەسەڵاتو هەر کەسێك نیعمەتی ﷲ کە بریتیە لە ئایینی ئیسلام بگۆرێت پاش ئەوەی کە ئایینی پێ گەیشتو ناسی دەبێت هەروەك جووەکان چاوەڕوانی سزای سەخت بێت، چونکە بە راستیﷲخاوەنی تۆڵەی سەختە بۆ دوژمنانی ئایینو دوژمنانی پێغەمبەرەکەی. ئینجا دەفەرموێ:

(٢١٢) جوان کراوە بۆ بێ باوەڕان ژیانی دنیاو زۆر کەیفخۆشو شادو لوت بەرزن بەو سەروەتو سامانەی کە خوا پێی داونو هەر خەریکی کۆکردنەوەنو دەستیان بۆ بەخشینو سەرف کردنی لەسەر بڕیاری خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ قوچاوەو هیچی لێ دەرناچێتو گاڵتە بە موسڵمانەکان دەکەن کە کەم دەستو لاوازن کە ئەمەش وەسفێکی هەمیشەیی زۆربەی هەرە زۆری موسڵمانانە لە بەر چەند هۆیەك کە ئەمانەی خوارەوە گرنگەکانیانە :

یەکەم ـ موسڵمانی راستەقینە نەك هەر گیانی، بەڵکوماڵیشی فیدای رێبازی خوا دەکاتو لە باتی کۆکردنەوەی سەروەتو سامان بە خزمەت کردنی ئایینەوە خەریك دەبێت.

دووهەم ـ کۆکردنەوەی سەروەتو سامان لای موسڵمانی راستو دروست شتێکی لاوەکیەو دنیای بۆ خزمەتی ئایین دەوێتو بۆ دنیایەکی کۆتاو بۆ رۆژییەکی دیاری کراو هەرگیز ئایینەکەی نادۆڕێنێت.

سێیەم ـ موسڵمان لەو سەروەتو سامانە کەمەیش کە دەستی دەکەوێت، بێجگە لە زەکات بەشێکی تری تەرخان دەکات بۆکەم دەستانو هەتیوانو خزمان کە ئەم سێ خاڵە لەدنیادا زۆرجاردەبنە هۆی کەم دەستیو کەم سامانی موسڵمان بەڵام لەدوارۆژدا زۆردەوڵەمەندە.

چوارەم ـ رێگای ئایین بە زۆری کەم دەستانو چەوساوان بیری لێ دەکەنەوەو وەری دەگرن بەدرێژایی مێژوی کوفرو ئیسلام، هەمیشە خۆشگوزەرانان بێجگە لە بیر کردنەوە لە کۆکردنەوەی سامانی زیاترو رابواردنی خۆشترو چەوساندنەوەی کەم دەستان مەگەر بە دەگمەن ئەگینا بیریان لە ئایین مەگەر بۆ دژایەتی کردبێتەوە بە راستی ئەگەر بەڵێنی پەروەردگار نەبوایە، دەبوایە خاوەن باوەڕان لە هیچ کاتێکدا سەرکەوتنیان بە دەست نەهێنایە بەڵام پەروەردگارمان خاوەنی بەخشەو دەفەرموێ: ﴿ ئەوسا هەر شتێك دەبەخشن خوا جێگاکەی پڕ دەکاتەوە﴾. سەبەأ :٣٩.

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {قَالَ اللهُ عَز وَجَل أَنفِقْ أُنفِقْ عَلَيْكَ /البخاری/ خوای دەسەڵاتداری گەورە دەفەرموێ: ئەوەی ئادەم ببەخشە پێت دەبەخشم} جا بێ باوەڕان بە بۆنەی ئەو سەروەتو سامانەی کە هەیانە لە خۆیان بایی دەبنو گاڵتە بە خاوەن باوەڕان دەکەن خواش لە رۆژی قیامەتدا خاوەن باوەڕان بەرز دەکاتەوەو بە نازو نیعمەتی بێ وێنەو زۆرو هەمیشەیی بەهەشت خۆشبەختو شادیان دەکاتو ستەمکاران بە سزای سەختی جەهەننەم سەر شۆڕو رسوا دەکات.ئینجا دەفەرموێ: بەراستی خوا رۆزی دەدات بەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت لە دنیاو لە دوا رۆژدا بە بێ ژمار، واتە: سەروەتوسامان بە دەست خوایە و هەرخۆی دابەشی دەکات نە زۆریەکەی بەڵگەی چاك یان خراپی کابرایەو نە نەبونەکەی، بەڵکو هەردوو بۆ تاقیکردنەوەیەو پێویستە مرۆڤ ئاگای لە خۆی بێت.

ئینجا خوای گەورە باسی بەش بەشی خەڵكو دەست پێ کردنی ئەو بەش بەشیەمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢١٣) لە كۆنەوە خەڵك خاوەنی یەك بیرو باوەڕی ڕاستەقینەو یەك پارچە بوون هەتا نزیكەی سەردەمی نوح ﷺ ئیتر شەیتان دەوری خۆی دی‌و خەڵكی فێری بت پەرستی كرد، ئینجا خوا پێغەمبەرانی یەك لە دوای یەك نارد كە یەكەمیان نوحە ﷺ و ئاخریان محمدە ﷺ بۆ ئەوەی كەمژدەی بەهەشت بدەن بەو كەسانەی كە ئیشی باش دەكەن‌و بترسێنن ئەو كەسانەی كە ئیشی خراپ دەكەن بە جەهەننەم‌و لەگەڵ ئەو پێغەمبەرانەدا كتێبی نارد بۆ مەبەستێكی ڕاست‌و دروست تا ئەو پێغەمبەرە حوكم بكات لە نێوان خەڵكدا لە بارەی ئەو ناڕێكیەی كە هەیانە سەبارەت بە یەكتا پەرستی‌و پەیڕەوی پیاوانی چاك‌و دوور كەوتنە لە تاوان‌و بت پەرستی‌و شتانی پڕو پووچ‌وهەرئەوانە ناكۆكیان تێیدا نەبوتا كتێبیان پێ دراو پێغەمبەریان بۆ هات، واتە: لە سەرەتاوە دەیان وت: ئەگەر پێغەمبەرێك بێت یان پیاوێكی چاك بێت هەمومان دوای دەكەوین‌و ناكۆكی دروست ناكەین‌و خراپەش ناكەین، بەڵام كاتێ كە پێغەمبەر دەهات ناكۆكیان دروست دەكرد بە ڕاستی ڕەوشتی مرۆڤ ئاوەهایە لە پێش هاتنی پیاوچاك ئاواتی هاتنی دەخوازن لەپاش مردنیشی داخ وخەمی بۆ دەخۆن‌و لەسنور دەردەچن، بەڵام ئەگەر هات‌و كەسێكی چاكیان لێ پەیدا ببێت هەر زۆر زوو دەست دەكەن بەدژایەتی ئەگەر چی دەزانن ڕاستیشە وەك لێرەدا دەفەرموێ: پاش ئەوەی كە نیشانەی ئاشكرا دەهاتە لایان، ئینجا ناكۆكی‌و دژایەتیان دەست پێ دەكرد كە یاخی بون لەناو خۆیانداو حەسادەت وای لێ كردن كە دژایەتی یەكتر بكەن، ئەوسا ﷲ ڕێنمایی خاوەن باوەڕانی كرد بۆ ئەو شتەی كە ڕاست‌و دروستە‌و ئەوان ناڕێك بون تێیدا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە مرۆڤی موسڵمان پێویستە باوەڕ بێنێت‌و نابێت خۆی كەمتەر خەم بكات‌و چاوەڕێی ئەوە بێت كە ﷲ هیدایەتی بدات چونكە ﷲ دەفەرموێ: ڕێنمایی ئەو كەسانە دەكەین كە پێشەكی باوەڕیان هێنا بێ وەك دەفەرموێ:﴿ ئەو كەسەی كە لە پێناوی ئێمەدا كۆشش دەكات بە ڕاستی ئێمەش ئەو ڕێنمایی دەكەین﴾ عەنكەبوت: ٦٩.

لە فەرمودەیەكی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە كە دەفەرموێ: {ئێمە ئاخر ئوممەتین كە هاتوین‌و یەكەم ئوممەتین لە ڕۆژی قیامەتدا. ئێمە ئەوەڵ كەسین كە دەچینە بەهەشتەوە هەرچەند كە خاوەن پەڕاوەكان پێش ئێمە بوون‌و ئێمە لە پاشدا پەڕاومان دراوەتێ خوا ئێمەی ڕێنمای كرد بۆ ئەو شتەی كە ڕاست‌و دروستەو ئەوان ناڕێك بون تێیدا ئەمە ئەو ڕۆژەیە (جومعە) كە ئەوان بە هەڵەدا چوون لە بارەیەوەو بەیانی (شەممە) هی جوولەكەیە وپاش بەیانی (یەكشەممە) هی فەلەكانە} بەڵێ ئێمەو ئەوان لە زۆر شتا لە یەك جیاین ئەوان (بەیتولوقەدەس) دەكەن بە قیبلە ئێمە قیبلەی ڕاستمان دۆزیەوە ئەوان لە بارەی ئیبراهیمەوە ناڕێكیان هەیە هەندێكیان دەڵێن: ئیبراهیم جوولەكەیە‌و هەندێكیان دەڵێن: ئیبراهیم فەلەیە‌و هەندێكیان دەڵێن: هاوەڵ دانەرە (موشریك)، ئێمە بە ڕاستی ئیبراهیمیمان ناسی‌و دەزانین كە هیچ كام لەوانە نیە بەڵكو موسڵمانێكی پاك‌و ڕاست‌و خاوێن بووەو پێغەمبەرێكی خاوەن شكۆیە، ئەوان هەندێكیان عیسا بە خراپ ناو دەبەن‌و هەندێكیان بە خوای دەزانن ئێمە بە پێغەمبەرێكی پاك‌و بێ گەردو بەندەی ڕاستەقینەی خوای دەزانین، جا پێویستە ئێمە سەری شوكرانە بژێری نەوی كەین بۆ خواو سوپاسی بكەین كە ئێمەی لەو بەدبەختی‌و سەر لێشێواویە ڕزگار كرد چونكە هەر ئەو دەتوانێ بەندەی خۆی ڕێنمایی بكات‌و ڕێگای ڕاستی پێشان بدات وەك دەفەرموێ: تەنها ﷲ یە كە ڕێنمایی ئەو كەسانە دەكات كە ئارەزۆی لێ بێت بۆ ڕێگای ڕاست كە ئایینی بەرزو بە نرخی ئیسلامە. لێرەدا دەگونجێ (فاعل) **(یشاء)** بۆ (من)ـە كە بگەڕێتەوە واتە ﷲ كەسێك ڕێنمایی دەكات بۆ ڕێگای ڕاست‌و ئیشی باش كە ئەو كەسە خۆی ئارەزۆی لەو شتە ببێ‌و هەوڵی بۆ بدات وەك دەفەرموێ:جاخوا ڕێنمایی ئەو كەسانە دەكات كە باوەڕیان هێناوە.

وەك لەم پاڕانەوەدا هاتووە (ئەی خوایە حەقمان بە حەق پێشان بدەو یارمەتی مان بدە كە ڕێگای حەق‌و ڕاستی بگرین‌و ئەوەی كە ناڕەوایە بە ناڕەوا پیشانمان بدە كە دوور كەوینەوە لێی‌و نەیگۆڕی لێمان كە گومڕا ببین‌و بۆ پارێزكاران بمانكە بە پێشەوا واتە: ئەوەندە ڕەوشت بەرزی‌و چاكی‌و ئیخلاسمان تێدا بڕوێنە كە پارێزكاران چاومان لێ بكەن‌و بمانكەن بە مامۆستاو پێشەوای خۆیان. ئا بەم شێوەیە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای دەكردو لە خوا دەپاڕایەوە، چونكە دۆزینەوەی ڕاستی زانایی دەوێت‌و پەیڕەوی كردنیشی پیاوی دەوێت هەروەها ناسینی بەتاڵ‌و پڕو پووچ زانای دەوێت‌و دوور كەوتنەوەشی پیاوی دەوێت هەر بۆیە لە پاش ئایەتی ڕێنمایی سرنجمان بۆ زەحمەتی پێشوان ڕادەكێشێت‌و دەفەرموێ :

(٢١٤) ئایا ئێوە وا گومان دەكەن كە دەچنە ناو بەهەشتەوە بە ئاسانی‌و هێشتا نەهاتوە بە سەرتاندا ئەو بەڵاو سزاو زەحمەتانەی گەلانی پێش خۆتان كە ئەوان فەقیری یەخەی دەگرتن‌و زیانی گیانیان لێ دەكەوت‌و بە كارەساتی جۆراوجۆر دەهەژێنران بە شێوەیەك كە بە تەمای خۆیان نەدەمان وەك دەفەرموێ: هەتا ئەوەندە دەكەوتنە مەترسیەوە پێغەمبەرو ئەوانەی لەگەڵیدا بون لە خاوەن باوەڕان دەیان وت: كەی یارمەتی خوا دێت خۆ ئێمە خەریكە لە نێو دەچین؟ واتە: پێشوانی ئێوە ئاوەها بەهەشتیان بۆ خۆیان دەبچڕی‌و ئێوەش بە تەمان كە هەروا بە ئاسانی بچنە

ناویەوەو خۆتان لەسەر ئایینو بیرو باوەڕی ڕاستەقینەی ئیسلام کە بەرنامەی ڕاستو دروستی خوایە ڕەحمەت نەدابێت خۆ پێشوانی ئێوە ئەوەندە مەترسیان بەسەردا دەهات خەریك بو نائۆمید ببنو دەیان وت: ئاخۆ کەی یارمەتی خوامان بۆ بێت. خواش دەفەرموێ: ئاگادار بن کە یارمەتی خوا نزیکە چونکە پاشە ڕۆژ بۆ مرۆڤی پارێزکارە ئەوان هەرچی بکەن چەند ساڵێکەو دوایی دێت تەنها ئەوکەسە دەیباتەوە کە تەقوای هەبێتو لە خوای خۆی بترسێت. لەم بارەیەوە بوخاری لە خەبابی کوڕی ئەرتەوە ئەم فەرموودەی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ باس دەکات کە دەڵێ وتمان: ئەی پێغەمبەری خوا بۆ داوای یارمەتیمان بۆ ناکەیت بۆ ناپاڕێیتەوە لە خوا بۆمان؟ پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموی: {بە ڕاستی هەندێ لە خاوەن باوەڕانی پێش ئێوە بە مشارِ ئەکران بە دوو لەتەوە وازیان نەدەهێنا لە ئایینەکەی خۆیانو بە شانەی ئاسن گۆشتەکانیان لە ئیسقانەکانیان، دا دەماڵین بەڵام ئەوان هەر سور دەبون لەسەر بیرو باوەڕی خۆیان لە پاشان فەرموی بە ﷲ قەسەم، ﷲ ئەم دینە سەردەخات بە شێوەیەك کە سوار لە سەنعاوە بۆ حەزرەمەوت دەڕوات هیچ ترسێکی نیە بێجگە لە ترسی خواو ترسی گورگ لە حەیوانەکانی بەڵام ئێوە پەلە دەکەن، وەدەیان ئایەتی تر لەم مانایەدا هەیە وەك ئایەتی (١-٣) عەنکەبوتو ئایەتی (٣٨-٣٩) مەعارج. ئینجا ﷲ کە ئەم بوونەوەرەی ڕامو گەردەن کەچ کردوە بۆمانو کردوینی بە خاوەنێکی کاتی لەم ژیانەدا. مافی خۆیەتی کە ئامۆژگاریمان بکات لە هەمو بوارەکانی ژیان دا چ ژیانی تاکیو چ ژیانی کۆمەڵی جا وا لێرەدا باسی خەرج کردنمان بۆ دەکاتو ئەو کەسانەمان پێشان دەدات کە پێویستە ماڵی خۆمانیان بۆ سەرف بکەینو دەفەرموێ:

(٢١٥) پرسیارت لێ دەکەن کەچ شتێك ببەخشن؟ بڵێ: ئەوەی کە دەیبەخشن لە ماڵ با بیدەن بە دایكو باوکیان با بیدەن بە خزمی نزیکیانو بە هەتیوانو نەدارانو ڕێبواران. وە هەر ئیشێکی چاك کە ئێوە دەیکەن هەرچەند بچوكو کەم بێت خوا پێی دەزانێتو ون نابێت، ئینجا ئەوان پرسیارەکەیان بە جۆرێك کردووە بەڵام وەڵامەکەی بە جۆرێکی تر درایەوە ئەوان دەڵێن چ شتێك ببەخشین خوا دەفەرموێ: ببەخشن بەو کەسانە، واتە: وەڵام هی ئەم پرسیارە نیە، بەڵێ ڕاستەو ئەمەش جۆرێکە لە وەڵام دانەوەو بە پێ زانینی ڕەوان بێژی (البلاغە) پێی دەوترێت ڕەوشتێکی دانایانە (**الاسلوب ا كيم**) واتە: ئەم وەڵامە چاك بو پرسیاری بۆ بکەیتو ئەمە بە کەڵکە بۆت کەلەپێشدا وەڵامی پرسیاری مانگی یەك شەوەش،هەربەم شێوە بو گرنگ ئەوەیە بزانین لە کام ڕێگاوە پارەکەت بە کار بهێنیتو ماڵەکەت سودی هەبێ بۆت..دەڵێن مەیمونی کوڕی مەهران کە زانایەکی پایە بەرز بوو جارێك ئەم ئایەتەی خوێندەوەو وتی: ئا ئەمەیە جێگای ماڵ خەرج کردن ئیتر کەی باسی تەپڵو زوڕناو وێنەکانی دارو پۆشاکی دیوارەکانی تێدایە؟! بەداخەوە ، ئەوقسەبەنرخانە لەلای خۆ بەموسڵمان زانی ئەمڕۆ کاتی بەسەر چوە؟!!

ئینجا لە دواییدا ﷲ وەڵامی پرسیارەکەی بە چەشنی خۆی دەداتەوەو دەفەرموێ: هەرچی دەبەخشن لە ماڵ ﷲ ئاگادارە لێی هەروەك دەفەرموێ:﴿ هەرکەس بە ئەندازەی زەڕەیەك چاکە بکات دەیبینێتەوەو بە ئەندازەی زەڕەیەکیش خراپە بکات دەیبینێتەوە﴾ زەلزەلە ٧-٨ جائەگەر یەکەمی بە پاشگەز بونەوەو شیركو دووهەمی بە تەوبە هەڵنەوەشاندویەتەوە پاداشی یەکەمو سزای دووهەم چاوەڕوانیەتی. ئینجا ﷲ سەنگەرە بەرزەکەی ئیسلامان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢١٦) فەرز کراوە لەسەر ئێوەشەڕ کردن. (قتال) بە مانای شەڕە بەڵام جیهاد دەگونجێت بۆ شەڕو غەیری شەڕ هەرچەندە جیهادیش لە شەرعدا هەر بە مانای قیتالە، واتە: شەڕ کردن لەسەر دینی خواو گیان فیدایی بۆ پاراستنی دینی خوا پێویستە لە سەرتان هەرچەند ئەوشەڕەتان پێناخۆشە بەڵام نزیکە ئەو شتەی کە ئێوە پێتان ناخۆشە قازانج بێت بۆتان چونکە لە شەڕکردندا زۆر جار سەرکەوتن هەیە بە سەر ستەمکاراندا و دەستکەوتنی سامانو دەرکردنی دوژمن دەبێتو دەبن بە خاوەنی هێزو دەسەڵاتو بە ئازادانە بیرو ڕای خۆتان ڕادەگەیەنن، وە نزیکە ئێوە شتانێکتان بەلاوە خۆشەویست بێت کەئەوە زیانی تێدا بێت بۆتان، دانیشتنتان بەلاوە چاکە بەڵام پاش کەمێك ستەم کاران پەکتان دەخەنو وەك بەندەیەك کاروباری خۆیانتان پێ ئەنجام دەدەنو لە ئازادی بیرو باوەڕیش بێ بەشتان دەکەن، جا ئایا کەمێ سەختیو عومرێك سەربەرزی باشە یان کەمێ ئیسراحەتو تەمەڵیو عومرێك سەرشۆڕی؟ ئیتر با سزاو تۆڵەی پاشە ڕۆژیش بێتە سەری هەر بۆیە پێغەمبەری مەزن ﷺ دەفەرموێ: {**إِذَا تَبَايَعْتُمْ بِالْعِينَةِ وَأَخَذْتُمْ أَذْنَابَ الْبَقَرِ وَرَضِيتُمْ بِالزَّرْعِ وَتَرَكْتُمُ الْجِهَادَ سَلَّطَ اللَّهُ عَلَيْكُمْ ذُلًّا لَا يَنْزِعُهُ حَتَّى تَرْجِعُوا إِلَى دِينِكُمْ**

/ ابوداود، صححه الألبا / هەرکاتێك مامەڵەی عینەتان کردو دەستتان گرت بە کلکی مانگاوەو ڕازی بون بە کشتوکاڵو وازتان لە جیهاد هێنا ﷲ سەرشۆڕیەکی وا زاڵ دەکات بەسەرتاندا کە لای نابات هەتا نەگەڕێنەوە بۆ جیهاد} مەبەست لە مامەلەی عینە ئەوەی کە کرینی شتێك بۆ ماوەیەکی دیاریو فرۆشتنەوەی بە هەمان کەس بە حازر بە نرخێکی کەمتر، لەم فەرمودەشدا پێغەمبەرمان جیهاد بە دین ناو دەبات چونکە بەراستی دین بە تەواوی سەقامگیر نابێت مەگەر بە جیهاد ، وە لە فەرمودەیەکیتردا هاتوە کە ڕۆژێك دێتە پێشەوە وەکو لاکی حەیوانێك دەکەونو دین

دوژمنان وەك داڵ دادەبەزنە سەرتان، عەرزيان كرد ئەى پێغەمبەرى خواﷺ لە بەر كەمى وامان لێ دێت فەرموى نەخێر زۆرن بەڵام وەك بڵقى سەردەريان، لە ڕەواڵەتدا تەواون بەڵام لە ناوەرۆكو بيرو باوەردا بۆشنو وەهنتان تێدايە، عەرزيان كرد وەهن چيە؟ فەرموى: ئێوە زۆر دنياتان خۆش دەوێتو پێتان ناخۆشە بمرن جا هەر كاتێك واتان لێ هات ئيتر دوژمن زاڵ دەبێت بە سەرتان دا. هەروەكو ئەمڕۆ دەبينين كە ژمارەى موسڵمان يەك مليادرو نيو زياترە، بەڵام يەك حكومەتى خوامان نيە چونكە وەهنمان هەيە جا هەمومان دنيامان خۆش دەوێتو دەترسين بمرين نە خۆمان دەناسينو نە دەوروبەرى خۆمان بۆيە اللهدەفەرموێ: اللهدەزانێت ئێوە نازانن واتە اللهعالمەو دەزانێت چى باشە بۆمانو چى زيانى هەيەو پێويستە بزانين كە گەورەترينو بە نرخ ترين شت بۆ خاوەن باوەڕان جيهادە لە ڕێگاى خوادا بۆيە خوا فەرزى كردوە لە سەرمان.

(٢١٧) هۆى دابەزينى ئەم ئايەتە دەڵێن: پێغەمبەرى خوا ﷺ جەماعەتێكى ناردو نامەيەكى بە يەكێك لەوان كەناوى عەبدوڵا ى كوڕى جەحش بو داو فەرموى: بڕۆو ئەم نامەيە مەكەرەوە هەتا دەگەيتە (ناوچەى مەلەل) لەوێ نامەكە بكەرەوەو زۆر لە هيچ كام لە هاوەڵەكانت مەكە ئەويش چەند كەسێكى لەگەڵ خۆى برد هەندێك دەڵێن: بە خۆيەوە حەوت كەس بوونو چون تا ناوچەى مەلەلو نامەكەى سەير كرد كە پێغەمبەرى خوا ﷺنوسى بوى بڕۆ تا دەگەيتە (**بطن النخلة**)و ئاگات لە هەواڵەكانى قورەيش بێت هەر كەس بێت بە ئيختيارى خۆى لەگەڵ تۆدا با بێت و هەر كەسێكيش نايەت با بگەڕێتەوە هەمويان خۆيان سەرپشكن، ئينجا لەو جەماعەتە پێنج كەسيان لە كاتى نامە خوێندنەوەكەدا حازر بوون بەڵام دوو كەسيان كە سەعدى كورى ئەبى وەقاسو عوتبە بون وشتريان لێ ون ببوو چون بە شوێنيدا تا بەحران كە كانگەيەكە لە حيجازدا ئەوانى تر چون لەگەڵ فەرماندەكەيان داو كاتێ گەيشتنە ئەو جێگايە قافڵەيەكى قورەيش هاتو ئاخير ڕۆژى مانگى جمادى دووهەمو سەرەتاى ڕەجەب بو كە مانگێكى حەرامەو نابێت شەڕى تێدا بكرێت لە بەر ئەوە ئەو كۆمەڵە بەرێزە بە ئاخيرى مانگى جماد يان زانىو هێرشيان كردە سەر قافڵەكەو يەكێكيان بە ناوى عەمرى حەزرەمى يەوە كوشتو دوانيشيان بە ناوى عوسمانى كوڕى عەبدوڵاو حەكەمى كورى كيسانيان لەگەل قافلە كەدا بە ديل گرتو هێنايانەوە خزمەتى پێغەمبەرﷺ، جا پێغەمبەرﷺ نە قافلەكەو نە ئەسيرەكانى لێ وەرنەگرتن، واتە: ناڕازى بو بەو شەڕە ئەمەش تينێكى زۆرى كردە سەر ئەو كۆمەڵە بەرێزەو زۆر دڵتەنگ بون خواى خاوەن سۆز ئەم ئايەتەى ڕەوانە كردو

كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۖ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ۖ قُلْ قِتَالٌ فِيهِ كَبِيرٌ ۖ وَصَدٌّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَكُفْرٌۢ بِهِۦ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَإِخْرَاجُ أَهْلِهِۦ مِنْهُ أَكْبَرُ عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَٱلْفِتْنَةُ أَكْبَرُ مِنَ ٱلْقَتْلِ ۗ وَلَا يَزَالُونَ يُقَٰتِلُونَكُمْ حَتَّىٰ يَرُدُّوكُمْ عَن دِينِكُمْ إِنِ ٱسْتَطَٰعُوا۟ ۚ وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ يَرْجُونَ رَحْمَتَ ٱللَّهِ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢١٨﴾ ۞ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾

فەرموى: پرسيارت لێ دەكەن لە بارەى مانگى حەرامەوە بڵێ: شەڕ كردن لەو مانگەدا زۆر گەورەيە بەڵام ڕێگا گرتن لە بڵاو بونەوەى ئايينى خواو بێ باوەڕ بون بە خواو ڕێگا گرتن لە (مسجد الحرام)و دەركردنى خەڵكەكەى كە پێغەمبەرو يارەكانى بون ئەمانە گەورەترن لە لاى الله، لە شەڕ كردن لەو مانگانەدا، واتە: ئێوە ئەو هەمو تاوانانەتان كردوە هێشتا ڕەخنەش دەگرنو موسڵمانان بە تاوانبار دەزانن؟! سەربارى ئەو هەمو تاوانانەيش ئێوە موشريكنو شيركەكەى ئێوە گەورەترە لە كوشتن، واتە تاوانى هاوبەشى دانان بۆ اللهلە كوشتن گەورەترە. بەڵێ ئەو تاوانبارانە ئەو هەمو عەيبەى خۆيان نابينن هەروەك ئەمڕۆ كە كابرا ئارەق دەخواتەوەو قومار دەكاتو دەيان كردارى پيسى تر ئەنجام دەدات بەڵام ئەگەر عەيبێك بەموسڵمانێكەوە ببينێت زوو دەيكات بە قاڵە لە سەرىو دنياى لێ پڕ دەكات ڕۆژانە سەدان كەس بە بێ تاوان بە دەست ستەم كارانەوە دەكوژرێتو كەس باسى ناكات بەڵام ئەگەر موسڵمانێك تاوانبارێك لەتوڵەى خۆيدا بكوژێت هەر زۆر زوو بە تيرۆريستو تۆقێنەر ناو دەبرێتو بە دەيان زمان باس دەكرێتو سەدان لاپەڕەى لەسەر ڕەش دەكرێتەوە؟! بەراستى بەم جۆرە ڕەفتارانەيە وتراوە"بانێكەو دوو هەوا"

بەڵێ لە پاش هاتنى ئەم ئايەتە پێغەمبەر ﷺ قافڵەكەى دابەش كرد بەسەر ئەوكۆمەڵە يارە بەرێزانەداو قورەيشيش هاتن بۆ بەردانى دوو گيراوەكەيان بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەوانى تەسليم نەكرد چونكە ئەو دوو نەفەرەى كە چوو بون بە دواى

حوشترەکەیان دا هێشتا نەگەڕابونەوە فەرموی: تا ئەو دووکەسانەمان نەگەڕێنەوە نایان دەینەوە ئەگەر ئەو دووانەتان شەهید کرد بێت ئێمەش لە تۆڵەی ئەوان دا ئەم دوو نەفەرە دەکوژین. لە پاشدا ئەو دوو یارە بە سەلامەتی گەڕانەوەو پێغەمبەریشﷺ دوو گیراوەکەی بەرەڵا کرد، بەڵام حەکەم ناوەکەیان موسڵمان بو لە پاشدا لە سریەی (بئ ی معونة)دا شەهید کراو عوسمان ناوەکەیان بە کافری ڕۆیی، ئینجا خوای زاناو کاربەجێ دڵپیسیو نیەت خراپی بێ باوەڕانمان بۆ ئاشکرا دەکاتو دەفەرموێ: بێ پسانەوە کافران شەڕتان لەگەڵدەکەن تا ئەو کاتەی پەشیمانتان دەکەنەوە لە بیرو باوەڕتان ئەگەر توانایان هەبێت واتە هیچ کاتێك بێ شەڕ نابن لەگەڵتان دا ئەگەر توانایان هەبێت ئەوەتا ئێستا دەبینین کە دەیان بەرەیان دژی موسڵمانان کردۆتەوەو بە دەیان ڕێگایان گرتوتە بەر بۆ لە ناو بردنی ئایینو سڕینەوی لە دڵو مێشکی خاوەن باوەڕان دا لە دروست کردنی دەستەو پارتو ڕێکخراوی جۆراوجۆری دوژمن بە یەکی دژی ئایین، تا ڕادیۆو تەلەفزیۆنو ڕۆژنامەو گۆڤاری ڕەنگاوڕەنگ بۆ فریو دانو هەڵخەڵەتاندنی ڕۆڵەی موسڵمانان لە ئایینو بیرو باوەڕیان دا، پێویستە ئەوەش بزانین کە ﷲ هیچ زیانێکی پێ ناگات بەڵکو مرۆڤ خۆی زیان دەکات ئەوەتە ﷲدەفەرموێ: هەر کەسێك لە ئێوە لە بیرو باوەڕو ئایینی خۆی پاشگەز ببێتەوەو بە کافری بمرێت ئەوانە هەمو کردارە چاکەکانیان هەڵدەوەشێتەوەو بۆ هەمیشە لە ناو ئاگری دۆزەخ دا دەبن. لە پاشدا ﷲ باسی ئەوانە دەکات کە جیهاد دەکەن بۆ بەرز کردنەوەی وشەی خوداو دەفەرموێ:

(٢١٨) ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردوەو جیهادیان کردوە لە بەر خاتری خواو مەبەستیان تەنها بەرز کردنەوەی وشەی ﷲ بوە ئەوانە چاوەڕوانی سۆزو ڕەحمەتی خودانو خودایش زۆر لێخۆش بو بە سۆزە سەبارەت بە بەندەکانیو ناگونجێ ئەوانە لەو لێبوردنو سۆزەی ﷲ بێ بەش بن.

کۆچ دوو مانای هەیە. **یەکەم**: کۆچ کردن لە وڵاتو جێگای دانیشتن لە بەر ﷲ . **دووهەم**: وازهێنان لە تاوانو گوناح وەکو پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: {إن الْمُهَاجِرَ مَنْ هَجَرَ مَا نَهى اللهُ عَنْهُ/ ا د، النسائی. صحه الالبا / کۆچ کەر ئەو کەسەیە کە واز بهێنێت لەو شتانەی کە خودا قەدەغەی کردوون} کە مانای یەکەم مەبەستی سەرەکی ئایەتەکەیەو جیهادیش دیسان دوو مانای هەیە لە زمانەوانیدا بە مانای کارو کۆششو تەلاشە بەڵام لە شەرعدا مەبەستی شەڕ کردنە بۆ بەرز کردنەوەی ئایینی ئیسلام کە مانای دووهەم مەبەستەو لە تەواوی قورئانو فەرموودەکانی

پێغەمبەرداﷺ بەم مانایە هاتوە بێجگە لە چەند جێگایەکی کەم کە بە مانای زمانەوانی هاتوە. ئینجا ﷲدەفەرموێ:

(٢١٩) پرسیارت لێ دەکەن لە بارەی عارەقو قومارەوە بڵێ: لەم دووانەدا گوناهێکی گەورە هەیەو سوودیشی هەیە بۆ خەڵك جاری وا هەیە کابرا قومار دەکاتو دەیباتەوەو قازانج دەکاتو کابرای عارەق خۆر کەمێ هۆشی خۆی لە دەست دەداتو دەحەسێتەوە عارەق فرۆشیش سودێکی دەست دەکەوێت بەڵام گوناهەکەیان گەورەترە لە سودەکەیان، ئەم دوانە قەدەغە کردنیان بەچەند جاربووەو ئایەتەکانی بە قۆناغ قۆناغ هاتوەتە خوارەوە چونکە لەو سەردەمەدا هێشتا عارەقو قومار بە تەواوەتی حەرام نەکرا بونو خەڵك زۆر عادەتیان کرد بو بە عارەقو قومارەوە، تەنانەت دەڵێن: ئیمامی عومەر مەشهور بو بە (عمر الخمار) چونکە هەمیشە عارەقی دەخواردەوە ئینجا کاتێ کە یەکەم ئایەت دابەزی کەﷲدەفەرموێ: ﴿ ئێوە لە خورماو ترێ ڕزقی جوانتان دەست دەکەوێت لەگەڵ مادەی بێهۆشی کەردا﴾ وتی: مادام ﷲ مادەی بێهۆشی جیا کردۆتەوە لە ڕزقی جوان دیارە مادەی بێهۆشی ڕزقی جوان نیە ئیتر ترسی لێ نیشتو وتی: خوایە بەیانێکی شافیو کافی لەم بارەوە بنێرە تا بزانم حەڵاڵە یان حەرامە ئینجا ئایەت دابەزی کاتی لێ کەم کردنەوەو فەرموی:﴿ نزیکی نوێژ نەکەونەوە کاتێ کە سەرخۆشن﴾ ئاشکرایە نوێژ واجبەو ناتوانن وازی لێ بهێنن دەی ئیتر نەیان دەتوانی پاش نیوەڕۆ عارەق بخۆنەوە چونکەتا عەسر بە سەرخۆشی دەمانەوە،وە نەیان دەتوانی پاش عەسر بی خۆنەوەچونکە بۆ مەغریب هەر بە سەرخۆشی دەمانەوەو نەیان دەتوانی دوای مەغریبیش بخۆنەوە چونکە بۆ عیشا هەر بە سەرخۆشی دەمانەوە جابەم شێوەیە تەنها بەینی عیشاو بەیانیان بۆ مایەوە بۆ عارەق خواردنەوەو کاتیان کەم بویەوە ئەمە بو بە هۆی ئەوەی کە هەندێکیان بۆ هەمیشە وازی لێ بهێنن بەڵام دڵە گەرمو گوڕەکەی عومەر هەر ئاوی نەخواردەوەو هەر دوعای دەکرد، ئەی خوایە بەیانیەکی شافیو کافیمان بۆ بنێری تا بزانم حەڵاڵە یان حەرامە ئینجا پاش ماوەیەك ئایەتی (٩٠-٩١) لە سورەتی مائیدە دابەزی کە دەفەرموێ:﴿ئەی باوەڕداران عارەقوقومارو بت پەرستیو ئەنجامدانی کاربەهۆی ئەو بۆچونە تایبەتیەوە بەهەڵدانی تیرەکان(تیروپشك) پیسییەکن لەپیسییەکانی شەیتان سا وازی لێ بهێنن بەڵکورزگار ببن﴾ جا کە ئەم دوو ئایەتە دابەزی پێغەمبەرﷺ فەرموی عومەرم بۆ بانگ بکەن، ئەم دوو ئایەتەی بۆ خوێندەوە کە گەیشتە ئاخیریان عومەر وتی: ئەی پەروەردگارمان وازمان هێنا، ئەی پەروەردگارمان وازمان هێنا، لە پاشدا پێغەمبەری خواﷺ چووە ناو یانەکانیانەوەو ئەم دوو

ئایەتەی بۆ خوێندنەوە، جا هی وا هەبو کە بە سەر لێویەوە بو هی وا هەبو کەبە دەمیەوە بو هی واش هەبو کە نیوەی خواردبویەوە کاتێك کە ئایەتەکەی بۆ خوێندنەوە هەمویان رژاندیان، تەنانەت دەڵێن: ئەو رۆژە ئەوەندە عارەق رژا لە مەدینەدا کۆڵانەکانی مەدینەوەك لافاوی لێ هەڵنیشتبێ واچاوی دەدا. بەڵێخاوەن باوەڕانی راستەقینە ئاوەها پەیڕەوی فەرمودەی خواو پێغەمبەرەکەیانﷺ دەکرد کاتێ کە پێیان ئەوترا فلانە شت مەکەن بێ سێو دوو ئەمرەکەیان جێ بە جێ دەکرد بەڵام ئێمە هەزاران ئەحکامو فەرمودەی پێغەمبەر ﷺدەزانینو گوێشی پێ نادەینو خۆیشمان بە موسڵمان دەزانین؟! لێرەدا جێگای سرنجە کە زیانەکەیان زیاترە لە سودەکەیان بەڵام نەیفەرموە زیان فەرمویەتی گوناهەکەیان زۆرترە، بۆ؟ تا تێمان بگەیەنێت کە هەر شتێك زیانی هەبێت گوناهە بۆ نمونە، کابرای جگەرە کێش جگەرە زیانی هەیە بۆی جا هەر کاتێ کە جگەرەی خوارد دەتوانی پێی بڵێیت: ئەوکارەت گوناهە چونکە هەر شتێك زیانی هەبێت گوناهە بە کار هێنانی، ئەوەتە خوا لە باتی زیان، گوناهی ناو بردوە﴿ وَإِثۡمُهُمَآ أَكۡبَرُ مِن نَّفۡعِهِمَا ﴾ گوناهەکەیان گەورەترە لە سودەکەیان، دیسان ﷲوەڵامی پرسیارێکی تری دەداتەوەو دەفەرموێ: پرسیارت لێ دەکەن ئەی محمد چ شتێك ببەخشین ﷲدەفەرموێ: بڵێ: ببەخشن ئەوەی کەڵێتان زیادە لە راستی دا ئەوان پرسیاری جۆری شتەکانیان لە پێغەمبەرﷺ کردوە بەڵام خوا وەڵامی چەندایەتیان ئەداتەوە بۆ؟ چونکە حەق وایە پرسیار بکەن چەندێك ببەخشین نەك بڵێن چی ببەخشین، واتە: گرنگ لە جۆری بەخشینەکە نیە بەڵکو گرنگ لە چەندی بەخشینەکەیە کەئەمە وەك زانیوتە ئوسلوبی حەکیمی پێ دەوترێت، واتە: ئەو کابرایە زۆر لێزان نیە پرسیاری کردوە بەڵام پرسیار لێکراو حەکیمو لێ زانە جوابی داوەتەوە بە شێوەیەکی وا کە سودی هەبێت بۆی، چونکە جواب دانەوەی سوئالەکەی خۆی بێ سودە، واتە: خاوەن باوەڕان باش وایە هەر شتێك لە خۆیان زیادە ببەخشن. هەر ئاوەها بەم شێوەیە ﷲ بەیانی نیشانەکانی خۆی دەکات بۆتان بەڵکو ئێوەش بیر بکەنەوەو سودیان لێ وەرگرن.

(٢٢٠)هەم لە بارەی دنیاوەو هەم لە بارەی ئاخیرەتەوە، واتە: هەم بۆ ئەم ژیانەی خۆتان بیر بکەنەوەو هەم بۆ قیامەتتان. ئەڵبەتە ئایینی ئیسلام رێگای ئەوە ناگرێت کە مرۆڤ ماڵو سەروەتی حەڵاڵی ببێت بەڵام بەو مەرجە حەقە شەرعیەکانی لێ دەربکاتو لە رێگای شەرعیەوە بە دەستی بهێنێت پێغەمبەر ﷺ ئەو نۆ خێزانەی هەبو کە خاتون عائیشە دەڵێ: سێ مانگی ئاسمانگم دیت کە ئەکاتە دوو مانگی تەواو لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ کە نۆ خێزان

فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۗ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡيَتَٰمَىٰۖ قُلۡ إِصۡلَاحٞ لَّهُمۡ خَيۡرٞۖ وَإِن تُخَالِطُوهُمۡ فَإِخۡوَٰنُكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ ٱلۡمُفۡسِدَ مِنَ ٱلۡمُصۡلِحِۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَعۡنَتَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٢٠﴾ وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ وَلَأَمَةٞ مُّؤۡمِنَةٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكَةٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَتۡكُمۡۗ وَلَا تُنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَتَّىٰ يُؤۡمِنُواْۚ وَلَعَبۡدٞ مُّؤۡمِنٌ خَيۡرٞ مِّن مُّشۡرِكٖ وَلَوۡ أَعۡجَبَكُمۡۗ أُوْلَٰٓئِكَ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ وَٱلۡمَغۡفِرَةِ بِإِذۡنِهِۦۖ وَيُبَيِّنُ ءَايَٰتِهِۦ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٢١﴾ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِۖ قُلۡ هُوَ أَذٗى فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ وَلَا تَقۡرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَۖ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ فَأۡتُوهُنَّ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡۖ وَقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُم مُّلَٰقُوهُۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾ وَلَا تَجۡعَلُواْ ٱللَّهَ عُرۡضَةٗ لِّأَيۡمَٰنِكُمۡ أَن تَبَرُّواْ وَتَتَّقُواْ وَتُصۡلِحُواْ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٢٤﴾

بوون ئاگر نەکراوەتەوە. ئینجا دەڵێ: هەر ئاوو خورمامان دەخوارد. ئەگێرنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێك خورمای وشكو فرێ دراوی دیتەوە کە عەباسی ئامۆزای لەگەڵدا بو منداڵ بو فەرموی: بخۆ وتی: من تێرم. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {من دوو رۆژە هیچم نەخواردووە} ئینجا ئەو خورمانەی پاك دەکردەوەو دەیخواردن. لەحاڵێکدا ئەگەر داوای لەخوابکردایە نەك چیا بەڵکو خاکی بۆدەکرد بەزێڕ وەك لەئەسەردا هاتوەکە: ئەی محمدﷺ ئەگەر بتەوێت کێوی ئوحود کە چیایەکی گەورەیە دەیکەم بە زێڕو لەگەڵێشدا بگەڕێتو رەحمەتی هەڵگرتنیشی پێوە نەکێشی کەچی پێغەمبەر ﷺ شانازی بە فەقیرییەوە دەکات، بەڵێ با مرۆڤ هەندێك لە بارەی دنیاوە هەوڵ بدات بۆ دنیا بەڵام بەو شێوەیەو بەو رێگایەی کە شەرعیەو ئەوەی کە هەیەتی دیسان بە گوێرەی شەرع سەرفی بکات، پێویستە مرۆڤ ژیرانە بیر لە دنیا بکاتەوە خەمی بخوات ئەگەر بیر بکەیتەوە ژیانەکەت لە دنیادا حەفتا هەشتا ساڵێکە بەڵام ژیانی قیامەت بە مەلاین ساڵە بەڵکو هەر نابڕێتەوە، کەواتە حەقە مرۆڤ بە گوێرەی ئەو دوو ژیانە هەوڵ بدات کە چی بۆ ئەو ژیانە کورتەی دنیا چەند خۆمان ئەزیەت دەدەین بەڵام بۆ ئەو ژیانە درێژەی قیامەت هیچ خەفەت ناخۆین چاکیش بزانە پاداشتی ئەو دنیایە بە گوێرەی کرداری ئەم دنیایە جارێکی تریش ﷲلە وەڵامی پرسیارێکی تردا دەفەرموێ:

پرسیار دەکەن لە تۆ لە بارەی هەتیوانەوەو دەڵێن چی بکەین لەگەڵ هەتیوان داو چۆن لەگەڵیاندا هەڵسوکەوت بکەین؟

بڵێ: ئەگەر ماڵی خۆیان جیا بێت چاکەو ئەگەر ئێوە خواردنو خواردنەوەتان تێکەڵاو بە هەتیوان بکەن براتانن‌و خراپ نیەو خوا دەزانێت گەنەکار کێیەو چاکە کار کێیەو دەزانێت کێ بە نیەتی خراپ تێکەڵاو بە هەتیوان دەبێت‌و دەیەوێت ماڵ‌و سەروەتەکەیان بخوات‌و کامیان بە نیەتێکی چاك تێکەڵاویان دەبێت کەواتە تێکەڵاو بون بە هەتیوان بە گوێرەی نیەتی خۆتانە. ئەوە بو کاتێ کە ئایەتی﴿ وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ ﴾ الأنعام: ١٥٢ وە ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَىٰ ... ﴾النساء: ١٠. دابەزی، ئەوانەی کە هەتیویان لا بو زۆر ترسیان لێ نیشت‌و خواردن‌و خواردنەوەی هەتیوەکانیان جیا کردەوە لە خۆیان‌و ئەگەر شتێکیان لێ بمایەوە بۆیان هەڵدەگرتن زۆر جار ئەو شتانە خەسار دەبوون ئیتر نەیان دەزانی چۆن بکەن‌و خزمەتکردنی هەتیویان بە لاوە زۆر سەخت بوو. اللّٰه ڕێنمایی کردن‌و ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە بۆیان‌و تێیگەیاندن کە ئەم تێکەڵاو کردنە هیچ تاوانێکی تێدا نیە ئەگەر ئەوان مەبەستیان باش بێ خواش ئاگاداری مەبەستی ئەوانەو دەزانی کێ مەبەستی باشەو کێ مەبەستی خراپەو دەیەوێت زیان بە هەتیوان بگەیەنێت بەم شێوەیە باری سەرشانیانی ئاسان کردن، دەبێ ئەوانیش سوپاسی خوا بکەن چونکە خوا دەیتوانی بڵێ نابێ تێکەڵاوی بکەن‌و نابێ بەخێویشیان نەکەن بۆیە فەرموی: ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بوایە ئێوەی دەخستە زەحمەتەوە. بە راستی اللّٰه خاوەنی دەسەڵاتەو ئیشەکانیشی بە حیکمەتن واتە دەتوانێت تۆڵە لە ئێوە بسێنێت ئەگەر خراپە بکەن.

وشەی(**عَنَت**)واتە ئێش‌و ئازاروسەختی،

(٢٢١) هەرگیز ئافرەتانی بت پەرست‌و هاوەڵ دانەربۆخوا نیکاح مەکەن هەتا باوەڕ دێنێت‌وکەنیزەیەکی خاوەن باوەڕ باشترە لە ئافرەتێکی ئازادی بت پەرست‌وهاوەڵ دانەر هەرچەند ئەو ئافرەتە هاوەڵ دانەرەتان بە لاوە چاك‌وزۆر جوان بێت، واتە: نیکاحی ئافرەتی موشریك دروست نیە بۆ پیاوی موسڵمان مەگەر واز لە شیرك بهێنێت‌و تەوبە بکات. وە دەفەرموێ: ئافرەتی موسڵمان نیکاح نەکەن لە موشریك ئەگەر چی پیاوانێکی چاك‌وجوان بن بەلاتانەوە، واتە: نە دروستە موشریك بخوازین وە نە دروستە ئافرەتیش بدەین بە موشریك، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئافرەت ناتوانێت بە بێ سەرپەرشت خۆی نیکاح بکات چونکە دەفەرموێ: نیکاحی نەکەن بۆ موشریك کەوا بو ئافرەتەکە خۆی ناتوانێ خۆی نیکاح بکات ئەم رایە رایەکی پەسەندە چونکە لەگەڵ رواڵەتی ئەم ئایەتەدا هاوتا دێتەوەو دیسان لە فەرمودەی پێغەمبەر داﷺ هاتوە کە دەفەرموێ: {لا نِكَاحَ إِلا بِوَلِيٍّ وَشَاهِدَيْنِ/ الط ا . صححه الالبا / نیکاح دروست نیە مەگەر بە سەرپەرشتێکی نێرینەو دوو شایەت. ئینجا اللّٰه دەفەرموێ: بەندەیەکی باوەڕ دار باشترە کەکچی خۆتان یان خوشکی خۆتانیان لێ نیکاح بکەن. نەك ئەو موشریکە هەرچەند پیاوێکی جوان‌و دەوڵەمەندو خاوەن دەسەڵات‌و شۆرەت بێت.

نابێ ئەوانە بتان خەڵەتێنێت چونکە ئەوانە خەڵکی بانگ دەکەن بۆ ناو ئاگری جەهەننەم بەڵام اللّٰه بانگتان دەکات بۆ بەهەشت وە لێخۆش بون بە ئیزنی خۆی. کەواتە ئەمانە دوو رێبازی جیاوازن کابرای باوەڕ دار بەرەو بەهەشت‌و بەرەو رەزای خوا دەڕوات بەڵام کابرای موشریك بەرەو ئاگری جەهەننەم‌و رقی خوا دەڕوات. پێویستە ئەوەش بزانرێت کە نوێژ نەکەر لە ریزی موشریکاندایەو تا تەوبەنەکات نە نیکاح دەکرێ‌و نەنیکاحیشی بۆ دەکرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {بَيْنَ الرجُلِ وَبَيْنَ الشرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصلاةِ/ مسلم وغ ه/ ئەو سنورەی کە لە نێوان پیاوی باوەڕدارو شیرك‌و کوفردا هەیە واز هێنان لە نوێژە} ئیتر کەی رەوایە ببیت بە هاوبەشی جەهەننەمی یان کچ‌و خوشکت بکەیت بە هاوبەشی جەهەننەمی؟! جا اللّٰه نیشانەکانی خۆی بەیان دەکات بۆ خەڵك بەڵکو بیر بکەنەوە.

لێرەدا ئەگەر بڵێن: بۆ ئێمە دەتوانین ژنانی ئەهلی کتێب مارە بکەین بەڵام نابێ ئێمە ژن بەوان بدەین؟

دەڵێین: ژنانی ئەهلی کتێب عەقیدەیان پارێزراو ئەبێت لای ئێمە بەڵکو هەر کاتێ ناوی موسا یان عیسا ببەن ئێمە رێزیان بۆ دائەنێین‌و دەڵێین﴿علی نبیناو علیە السلام﴾ لەسەر پێغەمبەرمان‌و ئەویش سەلام بێت. هیچ بێ رێزیەك نە بە تەورات‌و نە بە ئینجیل ناکەین ئەگەر چی یەقینمان هەیە کە گۆڕاون چونکە ئەسڵەکەیان لای ئێمە راستەو تا زەمانی خۆیان پەیڕەوی کردنیان واجب بوە بەڵام بە هاتنی پێغەمبەرﷺ هیچ ئاینێك لە هیچ کەس وەرناگیرێت لەدوا رۆژدا وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿هەر کەسێك بێجگە لە ئیسلام هەر رێبازێکی تری هەبێت لێی وەرناگیرێت‌و لە رۆژی دواییدا وا لە ریزی زیانکاراندا﴾ ئالی عیمران /٨٥، بەڵام ئافرەتی ئێمە لای ئەوان رێزی عەقیدەی ناگیرێت‌و گاڵتە بە پێغەمبەرەکەی‌و قورئانەکەی دەکەن. جا ئەگەر هەروا لەسەر ئایینەکەی خۆی بەردەوام بێت ماڵەکەی زیندانیەتی نە جێگای خۆشی‌و ئیسراحەت، وە ئەگەر واز لە ئایینەکەیشی بێنێت ئەوا چارە رەش‌و شەرمەندەی خودای خۆی‌و کەس‌و کاری بوە، جا ئیتر چ سودێك هەیە لەو ژن‌و ژنخوازیەدا؟ راستی فەرمو خوا، کە ئەوان بەرەوئاگر بانگ

دەكەن‌و خواش بەرەو بەهەشت‌و چاوپۆشی لێكردن بەئیزنی خۆی بانگ دەكات. ئینجا ﷲ یاسایەكی ترمان بۆ باس دەكات‌و دەفەرموێ:

(٢٢٢) ئەی محمد ﷺ لە بارەی حەیزەوە پرسیارت لێ دەكەن بڵێ ئەوە ئازارێكە دوچاری ژنان دەبێت جا لەو كاتەداخۆتان دوور خەنەوە لە ژنان‌و نزیكیان نەبنەوە بۆ جیماع هەتا پاك دەبنەوە، جا هەر كاتێ خۆیان پاك كردەوە ئەوسا لەولایەنەوە كە خوا دەستوری پێ داون لەگەڵیاندا هاوبەستەر بن‌و حاڵەتی ژن‌و مێردایەتی ئەنجام بدەن، بێگومان خوا ئەو مرۆڤانەی كە دەگەڕێنەوە بۆ لای‌و هەمیشە تەوبە دەكەن خۆشی دەوون‌و مرۆڤە پاكەكانی خۆش دەوێت. بەڵێ ئافرەت لە زەمانی پێش پێغەمبەرداﷺ كە دەكەوتە عوزرەوە دەیان كردە ژوورێكی تایبەتەوەو بۆی نەبو تێكەڵ بە كەس ببێت‌و خواردنیان لەگەڵدا بخوات چونكە بە پیسیان دەزانی بەڵام ئیسلام هات‌و ئەو بارە قورسەی لەسەر لابردو كردنی بە خوشكی پیاوان. وەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {إنمَا النساءُ شَقَائِقُ الرجَالِ/ ابوداود. صحه الالبا / ژنان هەر خوشكانی پیاوان‌وبەشێكن لێیان}

لەئەنەسەوە هاتوەكە جولەكە هەركاتێك كە ئافرەتێكیان بكەوتایە حەیزەوە نەلەگەڵیاندا نانیان دەخوارد نەلەیەك هۆدەیشدا لەگەڵیان دادەنیشتن جا لەم بارەوە یارەكان پرسیاریان لەپێغەمبەر ﷺ كرد، جا خوا ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلۡمَحِيضِ ﴾ ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {اصْنَعُوا كُلَّ شَيْءٍ إلا النكاحَ فَبَلغَ ذَلِكَ الْيهُودَ فَقَالُوا مَا يُرِيدُ هَذَا الرجُلُ أنْ يَدَعَ مِنْ أمرِنَا شَيْئًا إلا خَالَفَنَا فِيهِ فَجَاءَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ وَعَبادُ بْنُ بِشْرٍ فَقَالَا يَا رَسُولَ اللهِ إن الْيهُودَ قَالَتْ كَذَا وَكَذَا أَفَلَا نُجَامِعُهُن فَتَغَيرَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ ﷺ حَتى ظَنَنا أَنهُ قَدْ وَجَدَ عَلَيْهِمَا فَخَرَجَا فَاسْتَقْبَلَتْهُمَا هَدِيةٌ مِنْ لَبَنٍ إلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَرْسَلَ فِي آثَارِهِمَا فَسَقَاهُمَا فَعَرَفَا أَنهُ لَمْ يَجِدْ عَلَيْهِمَا/ أحمد. صحح الالباني / هەمو شتێكیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن تەنها جیماع نەبێت، جا ئەم قسەیە بە جوەكان گەیشتەوە ئەوانیش وتیان: ئەو پیاوە واز لەهیچ ئیشێكی ئێمە ناهێنێت‌و دژایەتیمان دەكات، جا ئوسەیدی كوڕی حوزەیرو عەبادی كوڕی بیشر هاتن‌و وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جوەكان واو وایان وتوە ئایا لەوكاتەیشدا جیماع لەگەڵ ئافرەتانی خۆماندا نەكەین؟ جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەموچاوی گۆڕا تاوامان گومانكرد كەلێیان عاجز بوە، جا ئەوانیش چونەدەرەوە لەو كاتەدا دیتیان كە هەندێ شیر بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ هات، ئینجا ناردی بەدوایاندا‌و شیری پێدان جا ئیتر زانیان كەلێیان عاجز نەبوە} بەڵێ بەم شێوەیە باری ئافرەتان سوك كراو ئەوسەختی‌و تەنگانەیان لەسەر لابرا. لە وشەی ﴿ حَتَّىٰ يَطۡهُرۡنَ / هەتا پاك دەبنەوە ﴾ وادەگەیەنێت كە بەپاكبونەوەیان لەوخوینە چونە لایان دروستە، بەڵام ﴿ فَإِذَا تَطَهَّرۡنَ /كە خۆیان پاك كردەوە ﴾ ئەوە دەگەیەنێت تا خۆیان نەشۆرن حەقی جیماعیان نیەو ئەمەیان ئاشكراترە، والله أعلم.

ئافرەت لەو ماوەدا بە بۆنەی ئەو خوێنەوە پاك‌و خاوێنی كاتی لە دەست دەدات، بۆیە پێویستە كاتی بڕانەوەی ئەو خوێنە خۆی خاوێن بكاتەوە چونكە پاك‌و خاوێنی ئەركێكی گرنگی موسڵمانانە وەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {الطهُورُ شَطْرُ الْإِ يمَانِ وَالْحَمْدُ لِلهِ تَمْلَأُ الْمِيزَانَ وَسُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلهِ تَمْلَآنِ أَوْ تَمْلَأُ مَا بَيْنَ السمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَالصلَاةُ نُورٌ وَالصدَقَةُ بُرْهَانٌ وَالصبْرُ ضِيَاءٌ وَالْقُرْآنُ حُجةٌ لَكَ أَوْ عَلَيْكَ كُل الناسِ يَغْدُو فَبَايِعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا أَوْ مُوبِقُهَا/مسلم/ پاك‌و خاوێنی بەشێكە لە باوەڕ الحمدلله كێشانەی چاكە پڕ دەكاتەوەوسبحان ﷲ والحمدلله نێوانی ئاسمانان‌و زەوی پڕدەكەنەوە یان پڕ دەكاتەوە، وە نوێژ روناكیەو چاكە بەڵگەیەو خۆگری رۆشناییەو قورئان یان بەڵگەیە بۆت یان دژتە هەمو مرۆڤێك كە رۆژ دەكاتەوە فرۆشندەی نەفسی خۆیەتی، جا یان ئازادی دەكات یان لەناوی دەبات}ئینجا ﷲ درێژە بە باسەكە دەدات‌و دەفەرموێ:.

(٢٢٣) ژنەكانتان كێڵگەن بۆتان، جا بچنە ناو كێڵگەی خۆتانەوە چۆن ئارەزۆتان لێیە بەم كارەتان بەرهەمێكی باش پێش بخەن بۆ خۆتان‌و چاوەڕوانی ئەولادێكی ساڵح بكەن ولە خوا بترسن‌و بزانن بێگومان دەگەن بە خوای خۆتان‌و مژدە بدە بە باوەڕداران كە پاشە رۆژێكی خۆشیان هەیە كە بریتیە لەو بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەی كە ﷲ دایناوە بۆیان.

هەندێ وشەی(أَنَّىٰ ) یان، بەمانای (حَيثُ) لێك داوەتەوە، واتە: كابرا لە پێشەوەو لە دواوە بێت دەتوانێت لەگەڵ هاوسەری خۆیدا نزیكی بكات بەڵام پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەیشی رۆشن كردوەتەوەودەفەرموێ: {مَلْعُونٌ مَنْ أَتَى امْرَأَتَهُ فِي دُبُرِهَا/ا دء أبوداود. حسنه الالبا / لەعنەت لێكراوە ئەو پیاوەی كە لە پاشەوە لەگەڵ خێزانی دروست دەبێت وەك كرداری قەومی لوت} چونكە ئەو شوێنە بێجگە لەزیان هیچ بەرهەمێكی لێ پەیدا نابێت.

لەجابیرەوە هاتوە كەدەڵێ: {كَانَتْ الْيَهُودُ تَقُولُ إِذَا جَامَعَهَا مِنْ وَرَائِهَا جَاءَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ فَنَزَلَتْ ﴿ نِسَآؤُكُمۡ حَرۡثٞ لَّكُمۡ فَأۡتُواْ حَرۡثَكُمۡ أَنَّىٰ شِئۡتُمۡ ﴾ /البخاری/ جولەكە دەیان وت: ئەگەر پیاو لەپاشەوەبچێتە لای خێزانی ئەوە منداڵی چاوخێلی دەبێت، جا ئەم ئایەتە دابەزی كەئەفەرموێ: ﴿ خێزانەكانتان كێڵگەی خۆتانەو لەو جێگایەی كە

لَّا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا كَسَبَتْ قُلُوبُكُمْ ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿٢٢٥﴾ لِّلَّذِينَ يُؤْلُونَ مِن نِّسَائِهِمْ تَرَبُّصُ أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ ۖ فَإِن فَاءُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٢٦﴾ وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٧﴾ وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ ۚ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا ۚ وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ ۚ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ ۗ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٢٨﴾ الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ ۖ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ ۗ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ ۗ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٢٢٩﴾ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا تَحِلُّ لَهُ مِن بَعْدُ حَتَّىٰ تَنكِحَ زَوْجًا غَيْرَهُ ۗ فَإِن طَلَّقَهَا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يَتَرَاجَعَا إِن ظَنَّا أَن يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ ۗ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ يُبَيِّنُهَا لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٢٣٠﴾

دەبێتە هۆی زیاد بونی نەوەی ئادەمیزاد چۆنتان دەوێ سود وەرگرن﴾ }کەواتە گرنگ ئەوەیە کە لەو شوێنە دیاری کراوە نزیکی بکرێت، جا بزانن لەسەر ئەو کارەتان بێجگە لەوەی کە ئارەزۆی نەفستان دەشکێنن بە چاکەش بۆتان دەنوسرێت جاحەق وایە لەو کاتەدا یادی خوات لەبیر نەچێت، پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {**لَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ إِذَا أَتَى أَهْلَهُ قَالَ بِاسْمِ اللهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا فَقُضِيَ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ لَمْ يَضُرُّهُ** /البخاري/ ئەگەر هەرکەس لە ئێوە چوە لای خێزانی خۆیو وتی: بسم ﷲ، خوایە دوورمان بخەرەوە لە شەیتانو شەیتانیش دوور خەرەوە لەئەوەی کە دیکەیت بە رزقمان. جا ئەگەر خوا کردی منداڵێکیان ببێ، ئەوەشەیتان هیچ زیانێکی لێ نادات} ئینجا ﷲحوکمێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٢٤) سوێندەکانتان بە خوا مەکەن بە هۆی بەرگری کردن لە چاکەو پارێزکاریو بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی، جا خوا بیسەری هەمو قسە کانتانەو زانەری هەمو ئیشەکانتانە، واتە: نەکەن سوێند بە خوا بخۆن کە چاکە ناکەین یان سەر لە فلانە خزم نادەین یان قسە لەگەڵ باوکو کەسو کارم ناکەم شکانی سوێندەکەو کەفارەت دانیو ئەنجام دانی ئەوانەی کە لە خۆی مەنع کردوە چاکترە تا نەشکانیو دوورکەوتنەوە لە خزمانو چاکە کردن بە هۆی سوێندەکەوە. ﷲ داوای یەك بونو یەك دەستیو یەك ریزیو چاکەو پارێزکاری دەکات لە خاوەن باوەڕان ئیتر چۆن دەبێ ناوی ئەو زاتە بکرێت بە رێگر لەو شتە چاکانەدا؟! بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {**وَاللهِ لَأَنْ يَلَجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَارَتَهُ الَّتِي فَرَضَ اللهُ**/ الشيخان/واتە بە خوا قەسەم هەر کام لە ئێوە لەجبازی بکاتو زەحمەتی کەسو کاری بدات بە بۆنەی سوێند خواردنیەوە تاوانبارترە لەو کەسەی کە سوێندەکەی بشکێنێتو ئەو کەفارەتەی کە خوا فەرزی کردوە لە سەری بیدات}

(٢٢٥) خوای گەورە تۆڵەتان لێ وەرناگرێت لەو سوێندەی کە بەبێ ئاگایی دێت بەدەمتاندا وەك ئەوە کەدەڵێ: ئەرێ واﷲ، نە واﷲ ئەم سوێندانە بە سوێند حیساب نابن بەڵام تۆڵەتان لێ وەردەگرێت لەسەر ئەو سوێندەی کە لە دڵەوە بڕیاری دەدەنو زمانیش ئاشکرای دەکات بەڵام ئەو سوێندەی کە بە دڵ قەراری دەدەنو بە زمانتاندا نایەت دیسان ئەوەش بە سوێند حیساب ناکرێت، ئەمەش یەکێکە لەو نیعمەتە لە ژمارە نەهاتوانەی ﷲ هەروەك دەفەرموێ: ﷲلێبوردەو بە حەوسەڵەیە. کەفارەتی سوێند وەك لە سورەتی مائیدە لە ئایەتی (٨٩) دا باسکراوە بەم شێوەیە: خواردنی دەکەس بدات یان لیباسیان بۆ بکات یان بەندەیەك ئازاد بکات ئەگەر ئەمانەی نەتوانی سێ رۆژ رۆژوو بگرێت. لێرەدا ﷲدوو سیفەتی باس کردوە سەبارەت بەو سوێند خواردنەمان، یەکەم: (غفور) واتە ئەگەر هاتو سوێندێکت خوارد کە لە خۆوە هات بە دەمتا یان سوێندێکت خواردوو خێر لە شکانەکەی دا بو سوێندەکەت بشکێنەو کەفارەتی بدە. خوا بە رەحمە لە تاوانەکەت خۆش دەبێت.

دووهەم: (حلیم)ە بە حەوسەڵەیە، واتە: ئەگەر سوێندێکت خواردو حەق بوو نەیشکێنیت بەحەوسەڵە بەو خۆت بگرە. دیسان ﷲ یاسایەکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

□ بۆ ئەو کەسانەی کە سوێند دەخۆن لەگەڵ ژنەکانیان دا کە نەچنە لایان ماوەی چاوەڕێ کردن چوار مانگە ئەگەر گەڕانەوەو وازیان هێناو سوێندەکەیان شکاندو کەفارەتی سوێندەکەیان داو چونە لای خێزانەکانیان، ئەوسا بێگومان ﷲ لێ خۆش بو بەرەحمەو لە گوناهەکەیان خۆش دەبێت. جا ئەو کەسەی کە سوێندی وەها بخوات ئەگەر بۆ ماوەی کەمتر لەچوار مانگ بو ئەوە با ماوەکە تەواو بکاتو سوێندەکەی نەشکێنێت ونابێت حاکم زۆری لێ بکاتو نابێت ژنەکەش داوای سوێند شکاندنی لێ بکات چونکە خۆی کارێکی وای کردووە کە پیاوەکەی لێ ناڕەحەت بووە ئەم سوێندەی خواردوە، ئەگەر بۆزیاتر لە چوار مانگ بو با سوێندەکەی بیشکێنێت. ئەمەش نیشانەی سۆزو موحەبەتی خوایە بەرامبەر بە مرۆڤو پاراستنی مافی پیاوو ژنەو ئەگەر

پیاوەکان بە تەمای پەشیمان بونەوە نەبون لە سوێندەکەیان ئەوە ئیتر مافی ماتەڵ کردنی ژنەکانیان نیە، بۆیە خوا دەفەرموێ:

(٢٢٧) ئەگەر بڕیاری تەڵاق دانیان دا لە دوای چوار مانگەکە با تەڵاقی بدات، جا بەراستی خوا بیسەرەو زانەرە بە ئیشەکانیان. واتە: لە دوای ئەم چوار مانگە حاکم بانگی دەکاتو پێی دەڵێ پەشیمان بەرەوەو بچۆرە لای خێزانەکەت، جا ئەگەر چوو باشە ئەگەر نەچوو دەبێ تەڵاقی بدات جا ئەگەر تەڵاقی نەدا با حاکم تەڵاقی بدات چونکە حاکم لەم شێوە ئیشانەدا سەربەستەو دەتوانێت بڕیاری یەك لا کەرەوە بدات چونکە لە چوار مانگ زیاتر ستەمە کەلە ئافرەتەکە دەکرێت. وە خوای گەورەش هەرگیز بە ستەم رازی نیە. ئینجا ﷻ یاسایەکی ترمان سەبارەت بە ئافرەتی تەڵاق دراو بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٢٨) ئەو ئافرەتانەی کە تەڵاق دەدرێن دەبێ سێ نەوبەت چاوەڕێ بکەنو دروست نیە بۆ ئەوان بیشارنەوە ئەوەی کە خوا دروستی کردوە لە رەحمیان دا واتە: منداڵ یان حەیز کەبەوانە عیدە سابت دەبێت نابێ بیشارنەوەو دەبێ راستیەکەی بڵێن ئەگەر ئەوان باوەڕیان هەیە بە خواو بە دوارۆژ، ئەمە هەڕەشەیەکە لەوان ئەگەر پێچەوانەی راستی قسە بکەن. وە مێردەکانیان حەق ترو شایستە ترن بەگەڕانەوە بۆلایان (ئەگەر هەر سێ تەڵاقی نەکەوت بێت) ئەگەر هەمویان نیەتی ئاشتەواییان هەبو، وە بۆ ئافرەتان هەیە وێنەی ئەو مافەی کە پیاوان هەیانە لەسەر ئافرەتان بە چاکەو بۆ پیاوان بە سەر ژنانەوە پلەیەك هەیە پێویستە ئەوانیش ئەو رێزە دابنێن بۆ پیاوانو بە سەرپەرشتی خۆیانیان بزانن چونکە پیاوان بە هێزترن لەوانو بە ماڵی خۆیان ئەوان بە خێو دەکەنو زەحمەتی زیاتریش دەکێشن، ﷻ سەرپەرشتیو خزمەتی ئافرەتی خستۆتە سەر پیاوانو ئافرەتانیش دەبێ سوپاسی پیاوان بکەن، چونکە پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: {مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللهَ/ أبوداود الترمذي. صحه الالبا / هەرکەسێ سوپاسی خەڵك نەکات سوپاسی خواش ناکات} ئەمە فەرمانی خوایەو خواش خاوەنی دەسەڵاتەو ئیشەکانی بە حیکمەتە.

وشەی (قُرُوءٍ ) کۆی(قرء )هەندێك دەڵێن: حەیزەو هەندێك دەڵێن: پاکیەتیە، واتە سێ حەیز یان سێ پاکی لە پاش ئەو تەڵاقە ئەوسا عیدەیان تەواو دەبێت تا ئەو سێیە تەواو نەبێت نابێ نیکاح بکرێن لە کەسو نابێ لەو عیدە دا هیچ کەسیش خوازبێنیان بکات. بە داخەوە لە هەندێ جێگادا ئافرەت بە بچوکی مارە دەبڕن بەڵام کاتێ گەورە بون بە یەك رازی نابنو ئافرەتەکە لەگەڵ کەسێکی تردا دەست تێکەڵ دەکاتو وەعدەی پێ دەداتو کابراش پارەی مێردی پێشوو دەدات، ئینجا مارەی دەبڕن کە ئەمە تاوانێکی زۆر گەورەیە وەك لە ئایەتی دووسەدوسیوپێنجی هەمان سورەتدا دێت. جا پێویستە ئەو ئافرەتانەش خۆیان بپارێزن لەو تاوانە تا تەڵاق نەدرێن نابێ هیچ پەیوەندیەك پەیدا بکەن بە هیچ کەسێکەوە لە بارەی ژنو ژن خوازییەوە ئەوانەش کە خاوەن عیدەن دەبێ راستی بڵێنو هیچ نەشارنەوە.

بەڵێ بەراستی چەندێك پیاو حەقی هەیە بە سەر ئافرەتەوە ئافرەتیش ئەوەندە حەقی هەیە بە سەر پیاوەوە بۆ نمونە: پێویستە کە ئەو ماڵی کابرا بپارێزێو داوێن پاك بێتو ماوە نەدات بە کەسێك کە لای مێردەکەی باش نەبێت بێتە ماڵیەوە، هەروەها پیاوەکەشی پێویستە رعایەتی ئەم مەسەلانە بکاتو بە شێوەیەکی جوان لەگەڵ هاوسەرەکەی خۆیدا بجوڵێتەوەو ئازاری نەداتو خۆراكو پۆشاکی بە شێوەی پێویستو باوی سەردەم پێ بدات.

وشەی(عَزِيزٌ)ی هێنا نەك پیاو بە هێزی خۆیدا بنازێتو ستەم لە ئافرەت بکات بەڵکو پێویستە بترسێت لە ستەمکاریو بزانێت کە هێزی خوا لەسەر هەمو هێزەکانەوەیە. وشەی (حَكِيمٌ)ی هێناوە تا ئافرەتان رازی ببن بەو سەرپەرشتیو گەورەییەی پیاوان، چونکە خوای دانا داینراوەو ئیشی خوایش بێ سود نیە. ئا بەم شێوەیە ﷻ ئەرکی هەریەك لە پیاوو ئافرەت دیاری دەکاتو هەردوویشیان دەترسێنێت تا لە سنور دەرنەچن ئەوەش بزانن کە خوا ناڕازیە بە سەرپەرشتی بێ سنور بۆ پیاوانو ماوە بە ئاغایەتی ئافرەتانیش نادات چونکە ئەم دوو جۆرە دروستکراوە هەردوو موڵکی خودانو دروستکەر دەزانێت دروستکراو چی بۆ باشەو چی بۆ خراپە. جا پێویستە هەردوو سنوری خۆیان بزاننو لە سنور دەرنەچن.

بەداخەوە ئەمڕۆ بە ناوی مافی ئافرەتەوە زۆربەی ئافرەتان لە خشتە ترازاونو دروستکەری خۆیانو بەرنامەو پێغەمبەری خۆیان لە بیر چووەتەوەو بە دەهۆڵی نەفامو نەزانو بێ باوەڕو دوور لە رەوشت سەما دەکەن؟! خوشکی بەڕێز ئیسلامە تۆی بەرز کردوەوەو بەهەشتی لە ژێر لاقی تۆ داناو تۆی کرد بە دایكو بە یەکەم قوتابخانەی مرۆڤ هەروەها وەك گوڵ تۆی پاراست لە هەمو مرۆڤێکی نەفس نزمو دڵ نەخۆشو لاسارو بێ بەزەیی. تۆی کرد بە خوشکی پیاوان{النِّسَاءُ شَقَائِقُ الرِّجَالِ/ ئافرەتان خوشکانی پیاوانن} جا هەرچی زوتر فریای خۆت بکەوەو خۆت لەو مرۆڤە نەفس نزمو دڵ نەخۆشو لاسارانە رزگار بکەو دوای بڕیاری دروستکەری خۆت بکەوە کە خوایە کە سبەینێ دەچیتەوە خزمەتیو حیسابت لەگەڵدا دەکات بتەوێ یان نەتەوێ.

ئایا باوەڕت بە دەسەڵاتو دانایی اللّٰه نیە؟ دەی بۆچی سەرپێچی لە فەرمانەکانی اللّٰه دەکەیتو بەو بەشکردنەی ئەو ڕازی نابیت؟ خوای خاوەن دەسەڵاتو دانا لە بیر چوونەوەی لە تۆدا زیاترداناوە تا ئێشو ئازارەکانی سك پڕیو منداڵ بونت لە بیر بچێتەوەو ئامادەی چەند جار سك پڕ بونو مناڵ بون ببیت ئینجا بۆ منداڵ بون بتەوێتو نەتەوێت پێویستیت بە پشووئیسراحەتە هەروەهالە کاتی عوزریشدا ئێشو ئازارت هەیەوحەسانەوەت پێویستە، بەڵام پیاو نە باردار دەبێتو نە عوزری هەیەو لە بیر چوونەوەش لەودا کەمترە دیسان لە بەر ئەو هەمو سودو قازانجەی کە هەندێکی هەمومان دەزانین بگرە زۆریشی هێشتا هەر نایزانین، جا کەی ڕەوایە تۆ بەو هەمو ئێشو ئازارەی سك پڕیو عوزرەوەو بەو لە بیر چوونەوە زۆرتەوە بکرێیت بە سەرپەرشتی پیاو؟ ئەمەش بە هیچ شێوەیەك بەڵگەی سوکیو کەمی ئافرەت نیە چونکە دروستکەر ئەم دوو ڕەگەزەی بە شێوەیەکی جیاتر لە یەك دروستکردوە تا پێویستیان بە یەك هەبێتو لە یەکتری بێ نیاز نەبنو بە یەکەوە بژینو زەوی ئاوەدان بکەنەوە﴿ئایائەوزاتەی کەزۆر ووردبینو بە ئاگایە بە دروستکراوی خۆی نازانێت؟﴾مولك/ ١٤. بۆ نموونە سەیارەی وا هەیە پێنج کەس هەڵدەگرێتو سەیارەی وا هەیە دە تەن بار هەڵدەگرێت ئەمە مانای ئەوە نیە کە ئەو سەیارەیەی پێنج کەس هەڵدەگرێت بێ قیمەتەو ئەوی تر بە قیمەتە نەخێر بەڵکو بە پێچەوانەوە جاری وا هەیە کەیەکەمیان لە دووهەمیان بە قیمەتترو گرانترە بەڵام دەبێ هەریەکەی باری خۆی هەڵگرێت ئایا مەعقولە تەنێ بلوك لەو سەیارە پێنج کەسیە بار بکرێت یان ئەو قەلابە دە تەنیە هەمیشە لە بەینی دوو شاردا تەنها پێنج کەسی لێ بار کرێت؟ وتراوە" ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت کە ئەندازەی نەفسی خۆی دەزانێت" (بعل) واتە مێرد. ئینجا اللّٰه چۆنیەتی تەڵاق دانمان بۆ باس دەکەت دەفەرموێ:

﴿٢٢٩﴾ تەڵاق دوو جارە جا لە پاش ئەو دوو جارە یان ژنەکانتان لە لای خۆتان دابنێن بە تەواوەتیو باسی تەڵاق نەکەن یان سێیەم جار بەرەڵایان بکەن، واتە: لە جاری سێهەم دا یان بە شێوەیەکی چاكو عورفو عادەت بیانهێننەوە یان بەرەڵایان بکەن بە شێوەیەکی جوان نەك بە شێوەیەکی دوژمنانەو وناشیرینو زۆرەملە، ئەوسا دروست نیە لەوەی کە پێتان داون لەمارەییو خەرجی هیچ شتێکیان لێ وەرگرنەوە مەگەر لەوە بترسن کە نەتوانن سنورێ کە خوا بۆی داناون بپارێزن ئەوسا ئەگەر هاتو ترسان کە نەتوانن ئەو سنورەی خوا بپارێزن ئەوە لەو کاتەدا بە تاوان بۆتان دانانرێت ئەگەر ژنەکە فدیەی خۆی بدات واتە ئەو مارەییەی بۆ مێردەکەی بگەڕێنێتەوە. ئەمە پێی دەوترێت (خلع).

لێرەدا وشەی (مرة) بەکارهێنراوە بۆیە زانایان دوو جۆر بۆچونیان هەیە لەم بارەوە هەندێکیان دەڵێن بە مانای ژمارەیە، جا ئەگەر کابرا سێ تەڵاقی بە یەك جار خست تەڵاقەکەی دەکەوێت بەڵام بەشێکی تریان بەلایانەوە جارەو دەڵێن تا دوو جار ناکەوێت یەك تەڵاق بڵێیت یان زیاتر، هەر یەکەو بۆخۆیان بەڵگەیان هەیەو من دووهەمیانم بەلاوە نزیکترە.

بەڵێ ئەگەر بێ وەرگرتنی شت سنورەکەی خودا پێشێل دەکرا با کابرا مارەییەکەی وەربگرێتەوەو ژنەکەی تەڵاق بدات. جا بۆ ڕۆشن کردنەوەی مانای ئەم ئایەتە، دەڵێن :جارێکیان ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ وتی: من ڕازی نیم بە فلانە کەس، فەرموی: بۆ؟ ئافرەتەکە وتی: واللّٰه من لە ئەخلاقو دینی هیچ نیگەرانیم نیە، بەڵام قەسەم بە خوا هەندێ جاری وا هەیە کە دێت بۆ لام دەترسم کافر ببم چونکە ئەوەندەم پێ ناشیرینە لە ترسی خوا نەبێت تف دەکەمە ناو چاوی بەڵام لە بەر ئەوەی کە پیاوێکی موسڵمانە بەرگەی ئەو وەزعەناگرم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {مادام وایە کاتی خۆی مارەیەکەت باخچەیەك بوە باخچەکەی بدەرەوە بە کابرای مێردت تا تەڵاقت بدات ئەویش وتی: وا دامەوە پێغەمبەریش ﷺفەرموی: تەڵاقی بدە}

ئینجا ئەچینەوە سەر ئایەتەکە دەفەرموێ: ئەوەی کە باسمان کرد سنوری خوایە، ئەوسا لەو سنوورانە دەرنەچنو هەر کەسێك سنوورەکانی خوا ببەزێنێتو گوێ بە حەڵاڵو حەرام نەدات ئەوانە ستەمکارن. بەڵێ هەرکەسێ سنوورەکانی خوای بەزاند زۆر ستەمکارە پێشەکی لە خۆیو لە پاشدا لە خەڵکیش، ئینجا ئەگەر کابرا بە تەواوی تەڵاقی دا ئیتر چاك کردنەوەی نیە. وەك دەفەرموێ:

﴿٢٣٠﴾ خۆ کاتێ کە سێ جار تەڵاقی دا ئیتر لە دواییدا کابرا یان ژنەکەی پەشیمان بونەوە ناتوانن بە ژنو مێردی بێننەوە لای یەك تا پیاوێکی تر نیکاحی نەکاتو نەبێت بە ژنی، جا ئەگەر پاش ئەوە تەڵاقی داو عیدەی تەواو بو مێردی یەکەمی بۆی هەیە نیکاحی بکاتەوەو بیهێنێتەوە ئەگەر پێیان وا بو کە سنورەکانی خوا ڕێكو پێك دەبەنە سەرو ماف یەکتر دەدن ئەوە سنورەکانی خوایە کە ڕونی دەکاتەوە بۆ ئەو گەلەی کە زانایە.

ئەمە کاتێك دروستە کە کابرای دووهەم مەبەستی حەڵاڵ کردن نەبێت بۆ مێردی پێشوو. جا ئەو فڕوفێڵەی کە دەیکەن لەمبارەوە کە دێن ئەوکەسەی کە سێ تەڵاقی کەوتبێت ژنەکەی مارە دەبڕن لە کابرایەك بەو مەرجەی پاش چونە لای تەڵاقی بدات بەراستی ئەمە کارێکی زۆر ناپەسەندو نادروستە، چونکە پێغەمبەری

خواﷺ دەفەرموێ: {لَعَنَ اللَّهُ الْمُحَلِّلَ وَالْمُحَلَّلَ لَهُ / ابوداود، ابن ماجة،صحه الالبا / لەعنەتی خوا لەو کەسەی کە ئەو جۆرەنیکاحە دەکات، وە لەو کەسەیش کە بۆی دەکرێت}

کەواتە تەنها کاتێك دروستە کە ئەم کابرایە ئافرەتەکە نیکاح دەکات مەبەستی ئەوە نەبێت تەڵاقی بدات بۆ کابرا یان حەڵاڵی بکات بۆی.

عائیشە ڕەزای خوای لێ بێت دەڵێت پیاوێك ژنەکەی خۆی سێ جار تەڵاقداو ئینجا ئەو ژنە شوی کرد بە کابرایەك ئەو کابرایە بەر لە گواستنەوەی (واتە بەر لە جیماع) تەڵاقی دا ئینجا لە بارەی ئەم ئافرەتەوە پرسیار کرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا دروستە ئەم ئافرەتە نیکاح بکرێتەوە لە مێردەکەی پێشوی؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: {لَا حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَهَا كَمَا ذَاقَ الْأَوَّلُ/ متفق علیە/ نەخێر هەتا مێردی دووهەم شیرینیەکەی نەچەژی وەك مێردی یەکەم چەشتویەتی} واتە پێویستە جیماعی لەگەڵ دا بەکات پاشان ئەگەر تەڵاقی دا ئەو کاتە بۆ مێردی پێشو دروستەنیکاحی بکاتەوە.

ئینجا دەفەرموێ: ئا بەم شێوەیە خوای زاناو کاربەجێ سنوورەکانی خۆیمان بۆ باس دەکات تا بە هەڵەدا نەڕۆین. دەڵێن: لە پێش هاتنی ئیسلامدا ئەگەر کابرا ژنەکەی خۆش نەویستبایەو ئارەزۆی ئازاردانی بکردایە هەمیشە تەڵاقی دەدا تا نزیکی عیدە دەبویەوە، ئینجا دەی هێنایەوە ژێر نیکاحی خۆی هەتا ئارەزۆی لێ بوایە وای لێ دەکرد بۆ ئەوەی نەتوانێت شوو بکات، بەڵام ئیسلام هاتو ئەم کارەی قەدەغە کردو تەنها دوو جار دەتوانێت تەڵاقی بداتو بیهێنێتەوە.

(٢٣١) جا هەر کاتێ ژنانتان تەڵاق دا جا ئەو ژنانە گەیشتنە عیدەی خۆیان هەر ئەوەندەیان مابو کەبتوانێت بیهێنێتەوە ئەگەر توانای گەڕانەوەی هەبو واتە هەرسێ تەڵاقەی تەواو نەکەوتبو، ئەوسادەتوانن یان بە چاکی بیانهێننەوە بۆلای خۆتانو ڕاگیریان بکەن بە چاکە یان بەرەڵایان بکەن بە چاکە، ئیتر ڕاگیریان نەکەن بۆ ئەوەی کە زیانیان لێ بدەن.

جا ﷲ سەبارەت بە ئازاردانی ئەو ئافرەتانە دەفەرموێ: هەر کەسێ ئەو کارە بکات بە ڕاستی زوڵمی لە نەفسی خۆی کردوە چونکە دوچاری سزای خوا دەبێت، وە گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا نەکەنو فەرمانەکانی بە سوك نەگرنو باسی نیعمەتەکانی خوا بکەنو سوپاسی بکەن بۆ ئەو هەمو نیعمەتەی کە بە ئێوەی داوە لەوانە نیعمەتی ڕەوانە کردنی پێغەمبەرو قورئانە بەرێزەکەیو دانایيە پڕ پێزەکەی کە فەرمودەکانی پێغەمبەرمانەﷺ کە پڕیەتی لە داناییو زاناییو سوود بۆ بەرەی ئادەمیزادو بەو قورئانە ئامۆژگاری ئێوە دەکاتو لە خوا بترسنو بزانن کە خوا

وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍۚ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا۟ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُۥۚ وَلَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًاۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَآ أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِۦۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾ وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَٰجَهُنَّ إِذَا تَرَٰضَوْا۟ بَيْنَهُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِۗ ذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٣٢﴾ ۞ وَٱلْوَٰلِدَٰتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَٰدَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِۖ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ ٱلرَّضَاعَةَۚ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَاۚ لَا تُضَآرَّ وَٰلِدَةٌۢ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُۥ بِوَلَدِهِۦۚ وَعَلَى ٱلْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَۗ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَاۗ وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّآ ءَاتَيْتُم بِٱلْمَعْرُوفِۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾

عیلمی هەیە بە سەر هەمو شتێکداو هیچ شتێك لە خوا ون نابێت. یەکێکی تر لەو نیعمەتانە حەڵاڵ بونی هاوسەرگیریەو تەماشای ئەو هەمو سۆزو میهرەبانیە بکەن کەخوا لە نێوانیاندا دروستی کردوە. ﷲفەرموی: تەڵاق دوو جارە جا ئەگەر لەوماوەدا پەشیمان نەبونەوە جاری سێهەم ئیتر تەواو دەبێت، واتە: ئەم نیعمەتانەی خواتان لە بیر نەچێتەوەو گاڵتە نەکەن بەو هەمو نیعمەتانە کە بە ڕاستی هەموی پڕ لە حیکمەتو سوودە دەی با مرۆڤ ئاگای لە خۆی بێتو هەڵسوکەوتەکانی ڕێكو پێك بکات لەگەڵ فەرمانەکانی خواداو بزانێت کە خوا چاوی لێیەتی ئەگەر ئەو چاوی بە خوا ناکەوێت خوا ئەو دەبینێتو حیسابی گەورەو بچووکی لەگەڵدا دەکات. ئینجا فەرمانێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٣٢) هەر کاتێ ژنانتان تەڵاق داو گەیشتنە عیدەی خۆیان، ئەوسا ئەگەر ویستیان خۆیان نیکاح بکەنەوە لە مێردەکانی خۆیان بەرگریان لێ مەکەن، بۆ ڕۆشنکردنەوە وتمان: کابرا بۆی هەیە دوو جار ژنەکەی تەڵاق بدات جاری سێیەم تەڵاقی ئەدات بە تەواوی یان دەی هێنێتەوە بۆ لای خۆی جائەگەر دوو جار تەڵاقی داو ڕۆیشت پێویستی بە نیکاح کردنی بو یان کابرا ویستی بیهێنێتەوە بۆ لای خۆی با سەرپەرشتەکانیان نەڵێن: تۆ تەڵاقت داوە ئیتر پێت نادەینەوە شتی وا نەکەنو بۆیان مارە ببڕنەوە ئەگەر پێویستی بە مارە بڕین کرد، واتە: تەڵاقەکەی کەمتر لە

سێ جار بو بەڵام عیدەی ڕۆیشت بو لەم شێوەیەدا بێ مارە بڕینی تازە گەڕانەوەی دروست نیە ئەمەش هەر کاتێ کەژنو مێردەکە بە تەواوی ڕازی بون لە بەینی خۆیاندا. لەمەعقەلی کوڕی یەسارەوە هێنراوەکە: {أَنَّهُ زَوَجَ أُخْتَهُ رَجُلًا مِنْ الْمُسْلِمِ - عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَكَانَتْ عِنْدَهُ مَا كَانَتْ ثُمَّ طَلَّقَهَا تَطْلِيقَةً لَمْ يُرَاجِعْهَا حَتى انْقَضَتْ الْعِدَّةُ فَهَوِيَهَا وَهَوِيَتْهُ ثُمَّ خَطَبَهَا مَعَ الْخُطَّابِ فَقَالَ لَهُ يَا لُكَعُ أَكْرَمْتُكَ بِهَا وَزَوَّجْتُكَهَا فَطَلَّقْتَهَا وَاللهِ لَا تَرْجِعُ إِلَيْكَ أَبَدًا آخِرُ مَا عَلَيْكَ قَالَ فَعَلِمَ اللهُ حَاجَتَهُ إِلَيْهَا وَحَاجَتَهَا إِلَى بَعْلِهَا فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى ﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ إِلَى قَوْلِهِ ﴿وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ فَلَمَّا سَمِعَهَا مَعْقِلٌ قَالَ سَمْعًا لِرَبِّي وَطَاعَةً ثُمَّ دَعَاهُ فَقَالَ أُزَوِّجُكَ وَأُكْرِمُكَ/ الترمذي. صححه الالبا / یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەر ﷺ کە ناوی (معقل) بو خوشکی خۆی دابو بە کابرایەکی موسڵمان لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ جالای بو ئەوەندەی کەلای بو پاشان تەلاقێکی دابوو عیدەی تێپەڕی بو لە پاشان هەردووکیان پەشیمان بونەوەو یەکتریان زۆر خۆشدەویستو موسڵمانەکە داوای لە مەعقەل کردەوە کە بۆی مارە ببڕێتەوە، ئەویش وتی: هەی بێقیمەت من لە پێشەوە زۆر ڕێزم بۆ تۆ دانا مادام تەلاقت دا ئیتر هەرگیز ناگەڕێتەوەبۆلاتو مارەی نابڕمەوە ئاخر شتە بۆ تۆ، ئەڵێ: خوای زانا کەئاگای لە پێویستی ئەم دووانە بو بە یەکتر ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە﴿وَإِذَا طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ﴾ إِلَى قَوْلِهِ ﴿وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ ئینجا مەعقەل ڕازی بوو بانگی کردو وتی: ئەوا پێم دایەتەوەو بیسەرو پەیڕەوی کەری فەرمانی پەروەردگارم}

خوا دەفەرموێ: ئا بەوە ئامۆژگاری دەکرێت ئەو کەسەتان کە باوەڕی هەیە بە خواو بە ڕۆژی قیامەت. بەڵێ ﷲ ئاوا بڕیارەکانی خۆی باس دەکاتو تێتان دەگەیەنێت ئەوە پاکترین شتە بۆ ئێوە چونکەبەم شێوەیە کۆمەڵ پاك دەبێتەوە. هەم پێك دێنەوەو هەم دوژمنایەتی نامێنێ چونکە ئەگەر ئەو مێردە حەز لە ژنەکەی بکاتو ژنەکە حەز لە پیاوەکەی بکات لە دوایدا سەرپەرشتەکەی ماوەی مارە بڕین نەدات ئەوە ئەگەر ئەو ئافرەتە مێردێکی تریش بکات هەر دڵی لە لای مێردی پێشویەتیو هەمیشە دلگرانەو مێردەکەشی هەر بەو شێوەیە هەردووکیان لە نارەحەتی دا دەژین کە زۆر جار ئەم جۆرە ڕەفتارە دەبێ بە هۆی شەڕو هەرا کەواتە مادام دەگونجێو ڕازین بە یەکتر وازیان لێ بێنن با لە یەك مارە بکرێنەوە کەئەوە پاکترە بۆ ئێوە واتە پاك دەبنەوە لە هەمو شتێك هەم نەفستان پاك دەبێتەوە هەم عەقڵو ویژدانتان پاك دەبێتەوەو هەم نێوانیشتان لە شەڕو هەرا پاك دەبێتەوە ئەگەر بەم جۆرە ڕەفتار بکەن چونکە ئافرەتەکە خۆی مێردەکەی هەڵبژاردوەو گەڕاوەتەوە بۆ لای بەم شێوەیە دڵو دەرونو مێشکی پاکتر دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر بە ناڕەزایی بێت لەوانەیە شەیتان فریویان بدات بۆئەوەی تۆڵەی خۆی بکاتەوە پەنا بۆداوێن پیسی ببەن، کەواتە چاکترین شت ئەوەیە کە گوێ بگرین لە ﷲ چونکە بەراستی ﷲ دەزانێت چی بەسوودە، ئێوە نازانن‌و هەر خوا دەزانێت قازانج لە کوێ دایە. سبحان الله ئەم دوو ئایەتە چەند بە لەزەتن لەم شوێنەدا. لێرەدا جارێکی تر ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە ئافرەت ناتوانێت بێ سەرپەرشت خۆی مارە ببڕێت، بەڵێ بەم پەیوەندیە چاك‌و پاکە ئیسلام بناغەی کۆمەڵگا دادەمەزرێنێت. ئاشکرایە کەبەرهەمی ئەو پەیوەندیە منداڵە، ئینجا ﷲ باسی شیر دان دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٣٣) دایکان شیر ئەدەن بە منداڵەکانیان. ئەم وشەیە هەرچەندە لە شێوەی خەبەردا هاتوە بەڵام بە مانای ئەمرەو ئینشایە، واتە: ئەگەر مێردەکەی لەم حاڵەتەشدا تەلاقی بدات نابێ ئافرەتەکە بڵێت: شیری پێ نادەم، بەڵکودایکان دەبێ شیر بدەن، جا ئەو کەسەی کە دەیەوێت شیری تەواو بدات بە منداڵ دوو ساڵی تەواوە لە دوو ساڵ زیاتر سوودی نیە یا نەی درێتێ لەوەش خوارتر تەواو نیە شیردانەکە بەڵام تەواو کردنی دوو ساڵی پێویست نەکردوە چونکە دەفەرموێ: بۆ کەسێ کە دەیەوێت بە تەواوی شیر بدات دوو ساڵە کەوابو ئەگەر دایك‌و باوك ئارەزۆیان لێ بو کەمتری پێ بدەن دەتوانن بەو مەرجە لەو شیر کەم کردنەوەدا زیانێك بە منداڵەکە نەگات چونکە لە پێغەمبەرەوەﷺ هاتوە کە{لَا ضَرَرَ وَلَا ضِرَارَ/ ا د، ابن ماجة.صححه الالبا / زیان گەیاندن دروست نیە}

لێرەدا زۆرێ لە زانایان ئەمەیان وەرگرتوە کە شیر دان لە پاش دوو ساڵ نابێ بە هۆی مەحرەمیەت لە نێوان شیر دەرو شیر پێ دراو دا لەم بارەیەوە ترمزی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرمانﷺ بۆ دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ: {لَا يُحَرِّمُ مِنْ الرَّضَاعَةِ إِلَّا مَا فَتَقَ الْأَمْعَاءَ فِي الثَّدْيِ وَكَانَ قَبْلَ الْفِطَامِ/ الترمذي. صححه الالبا / حەرامیەت دروست ناکات شیر دان مەگەر کاتێك ڕیخۆڵەکان بکاتەوەو لە مەمکەوە بێت‌و پێش بڕینەوەی منداڵەکە بێت کە تەواو بونی دوو ساڵە} وەکو لە ڕیوایەتێکی تردا عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {شیر دان حەرامیەت دروست ناکات مەگەر لەو دوو ساڵە دا بێت}واجبە لەسەر باوکی منداڵەکە کە ڕزقی شیر دەرەکە بدات ئیتر شیردەرەکە لەو کاتەدا ژنی کابرا بێت یان تەلاقی دابێت مادام شیر دەدات بە منداڵەکە دەبێت باوکەکە بە شێوەی عورف‌و عادەت بژێوی بداتو لیباسی بۆ بکات بە چاکەو بە گوێرەی باوی خەڵك لەو سەردەمەدا هیچ نەفسێك داوای لێ ناکرێت مەگەر بە گوێرەی توانای خۆی نەبێت واتە ئەگەر پیاوەکە توانای نەبێت نابێ زۆری لێ بکرێتو دایکی منداڵ زیانی لێ نەدرێت بە هۆی منداڵەکەیەوەو باوکیشی نابێ زیانی لێ بدرێت بە هۆی منداڵەکەیەوە، بەڵکو پێویستە هەردوو لەگەڵ

وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٢٣٤﴾ وَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِيمَا عَرَّضۡتُم بِهِۦ مِنۡ خِطۡبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوۡ أَكۡنَنتُمۡ فِيٓ أَنفُسِكُمۡۚ عَلِمَ ٱللَّهُ أَنَّكُمۡ سَتَذۡكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّآ أَن تَقُولُواْ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗاۚ وَلَا تَعۡزِمُواْ عُقۡدَةَ ٱلنِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ ٱلۡكِتَٰبُ أَجَلَهُۥۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴿٢٣٥﴾ لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗۚ وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى ٱلۡمُوسِعِ قَدَرُهُۥ وَعَلَى ٱلۡمُقۡتِرِ قَدَرُهُۥ مَتَٰعَۢا بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٢٣٦﴾ وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدۡ فَرَضۡتُمۡ لَهُنَّ فَرِيضَةٗ فَنِصۡفُ مَا فَرَضۡتُمۡ إِلَّآ أَن يَعۡفُونَ أَوۡ يَعۡفُوَاْ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ عُقۡدَةُ ٱلنِّكَاحِۚ وَأَن تَعۡفُوٓاْ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۚ وَلَا تَنسَوُاْ ٱلۡفَضۡلَ بَيۡنَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾

یەکتردا بسازێنو بە سوودی منداڵەکە هەنگاو هەڵگرن ئەگینا هەردوو گوناهبار دەبنو هەروەکو ئەوەش پێویستە لەسەر میراتگرەکان ئەگەر منداڵەکە باوکی نەمابو ئەوان ئەرکی باوکی منداڵەکە ئەنجام بدەن، یان مابو بەڵام کەم دەست بو لێرەشدا نابێ ئەوان زیان بە شیردەرەکە بدەنو شیردەرەکەش زیان لەو کەلەپور بەرانە بدات، لێرەوە دەردەکەوێت کە ئەگەر کابرا ژنەکەی خۆی تەڵاق داو شیری بە منالی کابرا دەدا پێویستە لەسەر ئەو خاوەن منداڵە کە بژێوی بداتو لیباسی بۆ بکات بۆ ئەو ئافرەتە بە گوێرەی عادەتو باوی خەڵك لەو سەردەمەدا. ئینجا ﷲ درێژە بەم باسە دەداتو دەفەرموێ: ئەگەر ژنو پیاوەکە ویستیان منداڵەکە ببڕنەوە لە شیر مادام بە پرسو رای هەردووکیانە، ئەوسا گوناهیان ناگات با کەمتەریش بێت لە دوو ساڵ. وە ئەگەر ئێوە ویستتان کە ژنێکی تر شیر بدات بە مناڵەکەتان نەك دایکەکەی خۆی بەمەش گوناهتان ناگاتو دەتوانن بیدەن بە دایەنێك کە شیر بدات بە مناڵەکە بەو مەرجەی بە گوێرەی باوی ئەو سەردەمە مافی خۆی پێ بدەنو لە خوا بترسن.

جا تەماشای سۆزو بەزەیی خوا بکەن کە چۆن هەر لە منداڵیەوە چاودێریمان دەکاتو لە گەورەییدا لە تاوانو ستەم دەمانترسێنێت تا لە هەردوو ژیان دا خۆشبەختو سەرفەراز بین ئەوەتە لە پاش ئەم بڕیارە هەرە بەرزو بە نرخانە دەفەرموێ: بزانن کە ﷲ بەو شتانەی کە ئێوە دەیکەن بینەرەو هیچ شتێکی لێ ون نابێتو ئاگای لە هەمو ئیشەکانی ئێوەیە، کەواتە ئەگەر بە شێوەیەکی دادپەروەرانەو رێكو پێك نەجوولێنەوە ئەبێ چاوەڕێی تۆڵەو سزای خوا بکەنو ئەگەر ئیشەکانتان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بو با چاوەڕێی رەحمو سۆزی خوا بکەن. جاخوای گەورە بۆ سووك کردنی کاری ئافرەتان بڕیارێکی تر دەردەکاتو دەفەرموێ:

﴿٢٣٤﴾ ئەو کەسانەی کە دەمرن لە ئێوەو هاوسەرەکانیان دەمێننەوە ئەو ژنانە دەبێ چوار مانگو دە رۆژ، چاوەڕێ بکەنو خۆیان بگرن، دەبێ ئەو چوار مانگو دە رۆژ عیدە رعایەت بکەنو نابێ تا ئەو ماوەیە لیباسی جوان لە بەر بکەنو خۆیان برازێننەوە بەوشێوەکە لەپەڕاوەفیقهیەکاندا باسکراوە. جاهەر کاتێك گەیشتنە ماوەی خۆیان، واتە: چوار مانگو دە رۆژەکەیان تەواو کرد لەسەر پیاوانی سەرپەرشت گوناح نیە کە ماوە بدەن بەو ئافرەتانە دەربچن یان لیباسی جوان لە بەر بکەن بە مەرجێك بە شێوەی عورفو عادەت بێتو بە راستی خوا بەو ئیشەی کە ئێوە دەیکەن زۆر ئاگادارە.

بەڵێ، عیدەی ئافرەتێك کە مێردی دەمرێت دوو جۆرن چونکە ئەو ئافرەتە یان سك دارە یان بێ سکە (الحمل)، جا ئەگەر سك دار بوو ئەوە تەواو بونی عیدەکەی بریتیە لە دانانی سکەکەی چی زیاتر چی کەمتر لەو چوار مانگو دە رۆژە بخایەنێت.وەك لە سورەتی تەلاق/٤ دا دەفەرموێ: ﴿خاوەن سکەکان ماوەکەیان بە دانانی سکەکەیانە﴾ وە ئەگەر سکی نەبو ئەوە چوار مانگو دە رۆژە وەك لێرەدا باسی فەرمو بەراستی ئەمە سووك کردنی ئەرکی سەرشانی ئافرەتان بو چونکە لە پێشەوە ئەم ماوەیە ساڵێك بوەو لە ئایەتی ژمارە دووسەدوچلی هەمان سوورەت دا دێت. دیسان ئەوەش هەر بار سوکی بو لەسەر ئافرەتان چونکە لە پێشەوە دەبوایە ئەو ئافرەتە کە مێردی دەمرد بچوایە ژوورێکی زۆر بچوکی تاریکەوە بە لیباسێکی کۆن بۆ ماوەی ساڵێك نە خۆی بشۆردایەو نە بهاتایە دەرەوە لە پاش ئەو ساڵە دەهاتە دەرەوەو پشکەڵێکی فڕێ دەداو حەیوانێکی زیندویان بۆ دەهێناو خۆی بەودا دەسڕیەوەو دەڵێن: کەم وابوە ئەو حەیوانە بژیت لە پاش ئەو خۆ لێ سڕینە لە بەر پیسیو ناخۆشی ئەو بۆگەنەی کە لەو ئافرەتەوە دەهات؟! جا خوشکانی خوا ناس مافی خۆیەتی کەسەری کڕنوش بخەنە سەر خاك بۆ ئەو پەروەردگارەو هەزاران جار سوپاسی بکەن بۆ ئەو نیعمەتە گەورەو بۆئەو ئاسانکاریەی کە بۆی کردوون، نەخەڵەتێن بەدهۆڵوزوڕنای خوا نەناسو بێ ئابڕویان، ئینجا دەفەرموێ:.

﴿٢٣٥﴾ گوناح نیە بۆتان ئەگەر هاتو بە شێوەی رانواندنو ناراستەوخۆ بدوێن لەگەل ئەوئافرەتانەی کە لە عیدە دابن واتە

بلێن ئافرەتانی وەکو ئێوە پەکیان ناکەوێت دەیان پیاوی وەکو من پێویستیان بە ئافرەتی وەك ئێوە هەیە بەڵام نابێ رێك بڵێن: من تۆم دەوێت. یان لە دڵتان دا حەز بکەن ئەو ژنانە بهێنن ئەوەش دیسان گوناحتان ناگات خوا دەزانێ کە ئێوە لە مەودوا باسیان دەکەن، واتە: ئەگەر چی من دەزانم کە ئێوە لە پاش عیدە داوای دەکەن بەڵام ئەوە تاوان نیە بەڵام نابێ بە نهێنی بەڵێنیان پێ بدەن، جا ئەمە لە کوێو هەڵگرتنی ژن یان نیکاح کراوی کابرایەك لە کوێ کەچی خۆ بە مەلا زان ئامادەی مامەڵەکەی دەبێت؟! ئەی مەلای نامەلا بۆ شەرم لە خوا ناکەیت تۆ دەبێ نەفرین لەو جۆرە کەسانە بکەیت کە ئاوا بێ ترس سنورەکانی خوا دەبەزێنن کەچی بەکەمێ پارە ئیشیان بۆ ئاسان دەکەیتو دینی خۆت دەفرۆشیت بۆ دنیای خەڵك؟! چاکی وتوە شاعیر کە دەڵێت: (وَهَلْ أَفْسَدَ الدِّينَ إِلاَّالْمُلوكُ...وَأَحْبَارُ سُوءٍوَرُهْبَانُهَا؟ ئایا ئاینی خراپ کردوە جگە لە پاشایانوزانایانی خراپوعابیدە نەفامەکان؟) خوا لەو شاعیرە کوردەیش خۆش بێت کە دەڵێت: دەك بەفەناچێت مەلای نامەلا — بەردی بنچینەی دینت دەرهێنا.
تەماشای ئایەتی ٢٢٨ بکەرەوە.

بەڵێ ئەی خاوەن باوەڕان ئا بەو شێوەیە دەتوانرێت کۆمەڵگایەکی پاكو خاوێن هەبێت نەك بەو شێوەیەی کە ئەمڕۆ تێیدا دەژین. بەڵێ نابێ هیچ قسەیەکی بێ جێ لەگەڵ ئافرەتی عیدەدارا بکرێت مەگەر قسەیەکی جوانو عادەتی بێت وەکو لە پێشەوە باسمان کرد، نابێ نیکاحی بکەن تا ئەو ژنە عیدەی تەواو نەبێت، جا بزانن بەبێگومان ﷻ ئاگادارە بەوەی کە لە ناو دڵەکانتان دا هەیە وا مەزانن کە شتەکانتان لە خوا دەشارێتەوە کەواتە لە خوا بترسنو خۆتان بپارێزن لەسزای سەختی ئەو زاتە چونکە دەزانێت کە چ شتێك لە ناو دڵی ئێوەدا هاتو چۆ دەکات. وەبزانن کە خوا لێ خۆش بوو بە حەوسەڵەیە.

لێرەدا وشەی (غفور)ی بە کار هێناوە تا ئەگەر تاوانێکتان کرد یان وشەیەکی وا کە چاك نەبو هات بە دەمتان دا بە نەفامی، تەوبە بکەن خوا لێتان خۆش دەبێت، ئینجا لەو لاشەوە فەرموی (حلیم) بە حەوسەڵەیە. واتە: ئەگەر ژنێکت حەز لێ بو بەڵام ئەو ژنە لە عیدەدا بو نەکەی قسەی نهێنی لەگەڵ بکەیت بەڵکو خۆ بگرەو بە حەوسەڵە بە تا عیدەکەی تەواو دەبێت. ئینجا ﷻ یاسایەکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٣٦) بە تاوانو گوناح حیساب ناکرێت بۆتان ئەگەر مارە بڕی خۆتان بەر لەوەی کە بچنە لایانو مارەییان بۆ دابنێن تەڵاقیان بدەنوەدەبێ شتێکیان بدەنێ هەر چەند نەشتان گواستونەتەوەو مارەیشتان بۆ دانەناون، ئەو شتەیش بەگوێرەی بونو نەبونی کابرا دەبێت وەك دەفەرموێ: لەسەر دەوڵەمەند بە ئەندازەی خۆیو لەسەر فەقیریش بە ئەندازەی خۆی، کەلو پەلێکە کەبە شێوەیەکی عورفو عادەت پێی دەدرێت کە ئەمە مافێکە لەسەر چاکە کاران.

(ٱلۡمُقۡتِرِ) فەقیرە (ٱلۡمُوسِعِ) دارایە. بەڵام ئەگەر مارەییان بۆ دانرا بوو ئەوا بەم شێوەیە کە دەفەرموێ:

(٢٣٧) ئەگەر ژنانتان تەڵاق دا پێش ئەوەی بچنە لایانو مارەییتان بۆ دانا بون ئەوە دەبێ نیوەی مارەییەکانیان بدەنێ مەگەر ژنەکان عەفوتان کەن، واتە: ئەگەر ژنەکان وتیان: نامانەوێ ئەوە موڵکی خۆیانەو دەتوانن چاوپۆشی لێ بکەن یان ئەو کەسەی کە نیکاحی بە دەستەوەیە چاوپۆشی بکەن، جا کێیە کە ئەم نیکاحەی بە دەستەوەیە ناڕێکی هەیە هەندێك دەڵێن: سەرپەرستی ئافرەتەکەیە. دەتوانێت چاوپۆشی بکات لەو نیوە مارەیە ئەگەر چی ئەمە دەست خستنە ناو ماڵی خەڵکەو بە زیانیشە، بەڵام ماوە دراوە کە بڕیارێکی جیا کراوەیە (استسنائی)ە، هەندێك دەڵێن: مێردەکانیانە عەقدی نیکاحی ئەوانیان بە دەستەوەیەو قەبوڵیان کردوەو دەشتوانن هەڵی وەشێننەوە. واتە: مەگەر مێردەکانیان چاو پۆشی بکەن لە نیوەکەی ترو هەمو مارەییەکە بدات بە ئافرەتەکە ئەمەش هەر دروستەو ئیشێکی باشەو هەر کامیان ئەم بەشەی خۆیان ببەخشن بەمەبەستی ئاسانکاری ئیشێکی چاکیان کردوە. بۆیە دەفەرموێ: خۆ ئەگەر یەکتر عەفو بکەن ئەمە زۆر نزیکترە لە تەقواوە. خیتابەکە بۆ پیاوانە، جا ئافرەتانیش دەگرێتەوە هەر کامیان یەکتر عەفو بکەن ئیشێکی باشیان کردوە، ئەو رێزو چاکەکاریەی کە هەیە لە نێوانی خۆتان دا لە برایەتیو رەحمو شەفەقەتو دۆستایەتیو خزمایەتی لە بیرتان نەچێتەوەو کێشە دروست مەکەن کە ئەو خزمایەتیو دۆستایەتیە لابات. بە راستی ﷻ بینەری ئەو کارانەیە کەئێوە دەیکەن. ئەگەر بەچاکی رەفتار بکەن ﷻ پاداشتی چاکەتان دەداتەوە. وەئەگەر بە خراپیش رەفتار بکەن خوا تۆڵەتان لێ ئەسێنێتەوە، بە داخەوە ئەمڕۆ هەر پیاوو ژن لە یەك جیا بونەوە ئیتر هەمو شت لە بیر دەچێتەوە. ئینجا ﷻ بڕیارێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەی چەسپێنێت بەم بڕیارەی سەرەوە کە باسی خێزانە تا تێمان بگەیەنێت کە ئیسلام هەموی یەکەو پارچە پارچە ناکرێت نابێ هەندێکی بە لاوە چاك بێتو وازلە هەندێکی تری بهێنێت ئەوەتا لێرەدا لە پاش عائیلە باسی نوێژمان بۆ دەکات.

حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَـٰنِتِينَ ﴿٢٣٨﴾ فَإِنۡ خِفۡتُمۡ فَرِجَالًا أَوۡ رُكۡبَانٗاۖ فَإِذَآ أَمِنتُمۡ فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَمَا عَلَّمَكُم مَّا لَمۡ تَكُونُواْ تَعۡلَمُونَ ﴿٢٣٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا وَصِيَّةٗ لِّأَزۡوَٰجِهِم مَّتَٰعًا إِلَى ٱلۡحَوۡلِ غَيۡرَ إِخۡرَاجٖۚ فَإِنۡ خَرَجۡنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ فِي مَا فَعَلۡنَ فِيٓ أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعۡرُوفٖۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٤٠﴾ وَلِلۡمُطَلَّقَٰتِ مَتَٰعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِۖ حَقًّا عَلَى ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ وَهُمۡ أُلُوفٌ حَذَرَ ٱلۡمَوۡتِ فَقَالَ لَهُمُ ٱللَّهُ مُوتُواْ ثُمَّ أَحۡيَٰهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٢٤٣﴾ وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢٤٤﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٤٥﴾

﴿٢٣٨﴾ ئاگاداری نوێژەکانتان بن بە تایبەت نوێژی ناوەڕاست. لە بارەی نوێژی ناوەراستەوە قسەی زۆر هەیە بەڵام نزیك ترینیان ئەوەیە کە نوێژی عەسرە چونکە چەندین فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ ی لە سەرە لەوانە{فَقَالَ مَلأَ اللهُ قُبورَهُمْ وَبُيوتَهُمْ نَارًا كَمَا شَغَلُونَا عَنْ صَلَاةِ الْوُسْطَى حَتى غَابَتْ الشمْسُ وَهِيَ صَلَاةُ الْعَصْرِ/البخاري/ فەرموی:خواگۆڕەکانیان‌و ماڵەکانیان پڕ بکات لە ئاگر هەروەك چۆن سەرگەرمیان کردین لە نوێژی ناوەڕاست هەتا خۆر ئاوا بو، وە ئەوە نوێژی عەسرە} هەروەها ئیمامی موسلمیش بەم شێوەیە بۆمانی باس دەکات کە{خەریکیان کردین لە نوێژی ناوەڕاست نوێژی عەسر}وە هەڵسن بۆ خوا بە شێوەیەکی گەردن کەچانەو بەندایەتی خوا بکەن.

﴿قَـٰنِتِينَ﴾ گەردن کەچان.

ئەمە بڕیارێکی گشتیەو دەبێ مرۆڤ گەردن کەچ بێت بۆ هەمو حوکمێکی خوا. نوێژیش یەکێکە لەو حوکمانە. دەڵێن: تا ئەو ئایەتە دانەبەزی بو موسڵمانان لە بەینی خۆیاندا لە نوێژدا قسەیان دەکرد بەڵام کە ئەو ئایەتە دابەزی ئیتر موسڵمانان بێ دەنگ بون. بۆیە هەندێك وتویانە ﴿قَـٰنِتِينَ﴾ واتە (ساکتین) بێ دەنگان. واتە لەنوێژەکانتاندا بێدەنگ بن‌و قسە مەکەن‌و ئێمن‌و سێکن بن.

﴿٢٣٩﴾ جا ئەگەر ترسان‌و نەتانتوانی بوەستن بۆنوێژ کردن بە پیادە یان بەسواری بڕۆن‌و نوێژەکانتان بکەن، جا هەر کاتێك کە ئێوە ترستان نەما، ئەوسا یادی خوا بکەن‌و نوێژەکانتان بکەن هەروەکو خوا چۆن فێری کردون کە لە پێشدا ئەوەتان نەدەزانی‌و بە تەواوی قیام‌و رکوع‌و سجود ئەنجام بدەن. زۆرترین زانایانی تەفسیر لەسەر ئەوەن کە ئەم (خەوفە) لە جیهاد دا لە کاتی شەڕدا دەبێت. بەڵام دەگونجێت مەبەستەکە گشتی بێت، واتە: هەر کاتێ کە ترست هەبو چ لە دوژمن بێت یان لە دڕندە یان ترسی فەوتانی نوێژەکەت بو ماوەی هەڵسوکەوتت نەماوە وەکو لە سەیارە دابوی و ماوەیان نەدا کە دابەزیت‌و نوێژ بکەیت ئەتوانیت چۆنت بۆ بکرێت وا نوێژ بکەیت. ئیمامی بوخاری دەڵێ ئەوزاعی وتویەتی: ئەگەر سەرکەوتن نزیك بو توانای نوێژ نەبو کەبە هێما نوێژەکەیان بکەن ئەوە لەو کاتەدا نوێژەکەیان دوا بخەن تا دەکەونەوە ئاسایش‌و دوو رکات نوێژ بکەن، وە ئەگەر توانای دوو رکاتیان نەبو رکاتێك‌و دوو سوجدە ببەن، واتە: یەك رکات نوێژ بکەن بەسەو ئەگەر توانای رکاتێکیان نەبو دەبێ نوێژەکە دوا بخەن تا کاتی توانا. ئیمامی بوخاری سێ بەڵگەی لەسەر ئەم رەئیە باس کردوە. یەکەمیان: دواخستنی پێغەمبەر ﷺ نوێژی عەسر لە رۆژی خەندەق دا هەتا رۆژ ئاوا بو.

دووهەمیان: کاتی فەرمانی ئامادە بونی دا بە یارەکانی بۆ بەنی قورەیزە فەرموی: {لَا يُصَلِّين أَحَدٌ الْعَصْرَ إِلا فِي بَنِي قُرَيظَةَ. .....فَذُكِرَ لِلنبِي ﷺ فَلَمْ يُعَنفْ وَاحِدًا مِنْهُمْ /البخاری/ هیچ کام لە ئێوە نوێژی ئەم عەسرە نەکات مەگەر لە بەنی قورەیزە} ئەوەبو هەندێکیان لە رێگادا نوێژیان کردو وتیان: مەبەستی پێغەمبەر ﷺ پەلە کردن بوەو هەندێکیان نوێژەکەیان نەکرد تا چوونە بەنی قورەیزە بەڵام رۆژ ئاوا ببو کاتێك پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەمەی بۆ باس کرا، ئەو لۆمەی هیچ کام لەوانی نەکرد واتە بەوە رازی بوە.

سێهەم: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: هێرش کردنە سەر قەڵای شوشتەر دەستی پێ کردو نزیکی نوێژی بەیانی بو شەڕ زۆر گەرم بو توانای نوێژ کردنمان نەبو تا رۆژ بەرز بوەوە ئەو کاتە نوێژمان کردو دوا بە دوای نوێژەکە سەرکەوتین ئەنەس دەڵێت: هەمو دنیاو ئەوەی کە تێدایەپێم بدرایە بە ئەندازەی ئەو نوێژە پێم خۆش نەبو، بەڵام جمهور دەڵێن: نابێ دوا بخرێت. لەگەڵ رێزم بۆ ئەوان ئەوەی ئیمامی بوخاریم پێ خۆشە، هەر خوایش زانایە. ئینجا ﷻ لە پاش نوێژی ترس جارێکی تر باسی ئەو ئافرەتانە دەکات کە مێردیان مردوە بەم شێوەیە قورئان یاساکان تێکەڵ دەکات تا تێمان بگەیەنێت کە ئیسلام هەمو یەکەو نابێ پارچە پارچە بکرێت وەکو ئەمڕۆ کە دەیان حیزب‌و دەستەو کۆمەڵ بە ناوی ئیسلامەوە دروست بون‌و هەر یەکەی بەشێکی لە ئیسلام گرتوەو هەر خۆیشی بە راست دەزانێت! ئینجا دەفەرموێ:

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ مِنۢ بَعۡدِ مُوسَىٰٓ إِذۡ قَالُواْ لِنَبِيّٖ لَّهُمُ ٱبۡعَثۡ لَنَا مَلِكٗا نُّقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ قَالَ هَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِتَالُ أَلَّا تُقَٰتِلُواْۖ قَالُواْ وَمَا لَنَآ أَلَّا نُقَٰتِلَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَدۡ أُخۡرِجۡنَا مِن دِيَٰرِنَا وَأَبۡنَآئِنَاۖ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ تَوَلَّوۡاْ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ (٢٤٦) وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ بَعَثَ لَكُمۡ طَالُوتَ مَلِكٗاۚ قَالُوٓاْ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُ ٱلۡمُلۡكُ عَلَيۡنَا وَنَحۡنُ أَحَقُّ بِٱلۡمُلۡكِ مِنۡهُ وَلَمۡ يُؤۡتَ سَعَةٗ مِّنَ ٱلۡمَالِۚ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰهُ عَلَيۡكُمۡ وَزَادَهُۥ بَسۡطَةٗ فِي ٱلۡعِلۡمِ وَٱلۡجِسۡمِۖ وَٱللَّهُ يُؤۡتِي مُلۡكَهُۥ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ (٢٤٧) وَقَالَ لَهُمۡ نَبِيُّهُمۡ إِنَّ ءَايَةَ مُلۡكِهِۦٓ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلتَّابُوتُ فِيهِ سَكِينَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَبَقِيَّةٞ مِّمَّا تَرَكَ ءَالُ مُوسَىٰ وَءَالُ هَٰرُونَ تَحۡمِلُهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٢٤٨)

(٢٤٠) جا ئەو كەسانەی كە دەمرن لە ئێوەو هاوسەرانیان بە جێ دەهێڵن مۆچیاری بۆ هاوسەرەكانیان دەكرێ كە هەتا ساڵێك بمێننەوەو دەركردن نیە، خۆ ئەگەر خۆیان دەرچوون بۆ ئەوەی كەئیشێكی چاك بۆخۆیان ئەنجام بدەن كە لە عورفو عادەتدا پەسەند بو، ئەوە ئێوەی سەرپەرستی ئەو ژنانە هیچ تاوانێكتان لەسەر نیەو خوا خاوەنی دەسەڵاتەو ئیشەكانی بە حیكمەتە. ئەم ئایەتە هەندێك پێیان وایە مەنسوخە بە ئایەتی پێشو كە وتمان ئەگەر چی ئەم ئایەتە لە قورئان دا لە دوای ئایەتی پێشوو هاتوە بەڵام لەدابەزیندا ئەم لەپێش ئەودا هاتوە، بەڵام من واتێ دەگەم بڕیاری ئەم ئایەتە ئیختیارییەو بڕیاری ئایەتی چوار مانگ و دە ڕۆژ ئیجبارییە، جا باش وایە ساڵێك دەرنەچێت بەڵام ئەگەر هاتو ساڵێك نەیان توانی دەبێ چوار مانگو دە ڕۆژ دانیشن كەوابو ئەم دوو ئایەتە دژایەتیان نیەو پێویست بەوەناكات كە بوترێت هەڵوەشاوەتەوە(منسوخ) وە خوا زاناترە. لە پێشەوە فەرموی: ئەگەر ئافرەتێك تەڵاق دراو هیچ مارەیی نەبو، ئەوە دەبێ كەلو پەلێكی بۆ دابین بكرێت. لێرەدا بە گشتی دەفەرموێ:

(٢٤١) بۆ تەڵاق دراوان، جا ئیتر هەر جۆرێك بن بە شی ڕەوای خۆیان هەیەو دەبێ پێیان بدرێت بەگوێرەی عورفو باوی سەردەمی خۆیان ئەمە مافێكە لەسەر پارێزكاران. زانایان پێیان وایە ئەمە شتێكی واجبەو پێویستە هەر كەسێك بە هەر نەوعێ بێت ژنی تەڵاق دا بێجگە لەو حقوقەی كە دەكەوێتە سەری وەكو نیوەی مارەی یان هەمو مارەییەكەی ئەگەر چوو بێتە لای، بەڵێ ئەمەیە ڕەوشتی پەسەند لە ڕەوانگەی ئیسلامەوە نەك شەڕو تێ هەڵدانو مافی ئافرەت خواردن.

(٢٤٢) هەر ئا بەم شێوەیە خوای گەورە نیشانەكانی خۆی بۆ ئێوە ڕۆشن دەكاتەوە، بەڵكو ئێوە بیر كەنەوەو ئاوەزاتان هەبیو بزانن كە چۆن ڕەفتار دەكەن. ئینجا ﷻ ﷲ چەند ڕوداوێكمان بۆ دەگێڕێتەوە كە ڕوداوی مێژویین بۆ بتەو كردنی بیرو باوەڕی خوا ناسانو باوەڕ هێنان بە تواناییو زانایی خواو و دەفەرموێ:

(٢٤٣) ئایا تۆ خەبەرت پێ نەگەیشتوەو نازانیت ئەو كەسانەی كە دەرچوون لە ماڵەكانیان كە ئەوان هەزاران كەس بون، جا ﷻ ﷲ پێی فەرمون: بمرن هەمویان مردن لە پاشان زیندوی كردنەوە بە ڕاستی خوا خاوەنی نیعمەتو كەرەمە بە سەر خەڵك دا، بەڵام زۆربەی خەڵك سوپاسی خوا ناكەنو سپڵەو نمەك نەناسن. هەندێك دەڵێن: سێ هەزار كەس بون، لە ترسی مەرگ دەرچون دەڵێن تاعون پەیدا ببو ئەمانە هەستان لە ترسی ئەوەی كە نەمرن دەرچوون بەڵام پێی فەرمون: بمرن هەمویان مردن، دەڵێن چۆنە شیوێكو لەو شیوەدا هەمویان كۆبونەوەو دەنگێك لە خوارو ژووروی شیوەكەوە هاتو هەمویان بە جارێك مردنو رزین پێغەمبەرێك دای بە لایان داو دوعای بۆ كردنو ﷻ ﷲ زیندوی كردنەوە، بەم شێوەیە بۆ ئەوانو بۆ هەمو كەسێ دەری خست كە هەمو شت لای خودا ئاسانەو مەرگو ژیان بۆ ئەو یەكسانە. هیچ پەرچێك ناتوانێت ڕێگەی بگرێت لە هەر شتێك كە ئارەزۆی لێ بێت بە ڕاستی ئەم مەرگو ژیانەش یەكێكە لە نیعمەتە گەورەكانی خوا ئەگەر باش بیری لێ بكەنەوە بۆیە فەرموی: بە ڕاستی خوا خاوەنی نیعمەتو كەرەمە بە سەر خەڵك دا بەڵام زۆربەی خەڵك سوپاسی خوا ناكەنو سپڵەو نمەك نەناسن. دوا بە دوای ئەمە دەفەرموێ: مادام مەرگ بە دەست خۆتان نیە ئەگەر خوا ئیرادەی نەكرد نابێت وە ئەگەر ئیرادەشی كرد دەبێت ئیتر ئێوە ترستان لە چیەو بۆچی دەترسن لە دوژمنانتان :

(٢٤٤) دەی شەڕ بكەن لە ڕێگای خواداو بزانن كە ﷲ بیسەرە بۆ وتارتانو زانەرە بە كردارتان. ئاشكرایە كە ئەم جیهادەش بە بێ ماڵ نابێت لە بەر ئەوە ﷻ ﷲ جارێكی تر سرنجی موسڵمانانی بۆ ماڵ بەخشین ڕادەكێشیو دەفەرموێ:

(٢٤٥) كێیە ئەو كەسەی كەوا قەرزی جوان دەدات بە خوا، جاخوایش زیادی دەكات بۆی بە چەندین بەرابەری زۆر، هەر خوایە توانای هەمو شتێكی هەیە دەگرێتەوە و نایدات بە

هەندێكو فرەوانیش دەكات بۆ هەر كەسێ كە خوێ ئارەزوێ لێ بێت، وەهەر بۆلای خۆیشی دەبرێنەوە.. جا وەختێ ﷻ ﷲ بفەرموێ: (كَثِيرَةً) دەبێ چەند بێت. لە فەرمودەی قودسی دا هاتوە كە دەفەرموێ: {ئەی بنیام ببەخشە پێت دەبەخشم مەیگرەوە لێت دەگیرێتەوە}. ئینجا ﷻ ﷲ داستانێكی ترمان بۆ دەگێرێتەوە لە ناو بەنی ئیسرائیل داو دەفەرموێ:

(٢٤٦) مەگەر تۆ نازانیو عیلمت نیە كە هەندێك لەپیاو ماقولانی بەنی ئیسرائیلی لە دوای موسا ﵇ بە یەكێك لە پێغەمبەرەكانی خۆیان كە ئەو پێغەمبەرە (شمعون یان شمویل) ناو بوە وت: پاشایەك یان رێبەرێكمان بۆ دانێ تا لە رێگای خوادا غەزا بكەین. بەڵێ بەنی ئیسرائیلی كاتێ، كە لایان دا لە فەرمانی خواو دەرچوون خوا خەڵكێكی تری زاڵ كرد بە سەریان داو تەفرو تونای كردن، ئیتر نەپێغەمبەریان ماو نەپاشا. لە دوای دا ﷻ ﷲ پێغەمبەرێكی بۆ رەوانەكردن، ئینجا كە پێغەمبەریان بۆ هات پاشایان نەبو دەیان وت: ئەگەر بێتو ئێمە پاشایەكمان هەبێت ئیتر ئێمە بۆ تۆڵە سەندنەوەی خۆمان لەگەڵدوژمنانی خۆمان دا لەسەر ئایینی خوا شەڕ دەكەین. پێغەمبەرەكەیان وتی: ئاخر من دەترسم كە ئەگەر جیهاد فەرز كرا لە سەرتان ئێوە شەڕ نەكەن وتیان: چۆن ئێمە لە رێگای خوادا شەڕ ناكەین لەگەڵ ئەوەشدا كە ئێمە دەركراوین لە ناوماڵو خێزانی خۆمان؟چۆن شەڕ ناكەین چۆن تۆڵەی خۆمان ناسێنینەوە بەڵام لە كاتێك دا كە شەڕ فەرز كرا لە سەریان پشتیان تێ كرد تەنها ژمارەیەكی كەمیان نەبێت، بەڵێ مرۆڤ رەفتاری ئاوەهایە كاتێ جیهادو شەڕ نیە لە رێگای خوادا، ئاهو ناڵەیان بۆ جیهاد، بەڵام كاتێ كە جیهاد روو دەدات زۆربەیان پشتی تێ دەكەنو خۆیان دەشارنەوەو هەندێ جاریش ئیشەكە بە بێ جێ تەماشا دەكەن، بە راستی مرۆڤ بە زۆری لەسەر زیانی خۆیەتیو ستەم لە خۆی دەكات. جا ﷻ ﷲ زانەرەبەستەمكاران، دەزانێ كێ زاڵمەو كێیش مەزلومەو لێێ ناگۆڕێت.

(٢٤٧) پێغەمبەرەكەیان پێی وتن ئەوا ﷻ ﷲ تالوتی كرد بە پێشەواو پادشای ئێوەو كردی بە لێپرسراوتان وتیان: ئەوە چۆن دەبێت سەر پەرستی ئێمە بێتودەستیانكرد بە رەخنە گرتنو وتیان: ئێمە شایستەترین لەو كەببین بە پاشاو خاوەن دەسەڵات چونكە خاوەن ماڵین لە حاڵێكدا ئەو ماڵی وای نیەو هەژارە، پیاوێكی فەقیرە وا چۆن دەبێت قیادەی ئێمە بگرێتە دەست پێغەمبەرەكەیان ﵇ وتی: بزانن بەراستی ﷻ ﷲ ئەوی هەڵبژاردوە بە سەر ئێوەدا لە بەر شتانێك كە هەر خوێ دەزانێت، وەئەوی بەهۆی زانیاریو توانای لەشەوە، بەسەر ئێوەدا بەرز كردوەتەوە واتە: هەم عیلمی پێ داوەو هەم لەشی چاكوتەندروستی پێ داوە كە هەرئەم دوو مەرجەش پێویستە بۆ رەهبەر، لەودا هەن، سەروەت سامان مەرجی سەرپەرستی نیە چونكە شتێكە بە دەست خوایە هەندێك نزم دەكاتەوە كە زۆر زاناو ژیرەو هەندێكیش بەرز دەكاتەوە كە زۆر نەزانو گێلن وەك دەفەرموێ: هەر خوایە مالیكو مولكی خوێ دەدات بە هەر كەسێك كە ئارەزوێ لێ بێت ئەمە ئیتر نیشانەی باشو خراپی نیە نیشانەی بەرزو نزمی نیەو ماڵ ئەمانەتێكە خوا بە هەندێكی دەدات وەبە هەندێكی نادات، ﷻ ﷲ مولكی زۆر فرەوانەو رزقی زۆرەو زانایشەو ئیشەكانی لە روی زانینەوە ئەنجام دەدات نەك گۆترەكاریو دەشزانێت كە ئێوە چۆن رەفتار دەكەن لەگەڵ پێغەمبەرو بەرنامەكەیدا ئەمەش وەڵامێكی ددان شكێنی ترە بۆ ئەو كەسانەی كە بەرژەوەندیان كردوە بە خواو دەیپەرستن چونكە ئەگەر بەرژەوەندی رواڵەتی شتێكی زۆر گرنگ بوایە دەبوایە ﷻ ﷲ كابرایەكی ناودارو دەوڵەمەندی ئەوانی بكردایە بە رەهبەر تا بێ سێودوو دوای كەوتنایە.

بەڵێ ئەوان لە پێشدا تابووتێكیان هەبو كە هەندێك ئەسبابی تێدا بو وەك گۆپاڵو جلو بەرگی هارون وموسا، هەروەها چەندین شتی تر كە هەڵیان دەگرت لە پێش خۆیان دا بۆ هەر شەڕێك دەچوون سەر دەكەوتن بەڵام كە فەرمانی پێغەمبەرەكانیان شكاندو لایان دا تابوتەكەیان برا ئیتر ئەوان شكەستیان خواردو زەلیل بون، ئینجا پێغەمبەرەكەیان وتی: یەكێك لەو بەڵگانەی كە ﷻ ﷲ تالوتی بۆ ئێوە هەڵبژاردوە ئەویە تابوتەكەتان كە مایەی سەركەوتنو ئارام بەخشینە بۆ ئێوە لە لای خوای خۆتانەوە بۆتان دێتەوە دەڵێن. فریشتە لە ئاسمانەوە هاتنو بۆیان هێنانەوە ئەوان بە چاوی خۆیان بینیانو گەیشتە بەردەستیان ئەوەتە خوا دەفەرموێ:

(٢٤٨) پێغەمبەرەكەیان پێی وتن: بە راستی نیشانەی پاشایەتی ئەو بە سەر ئێوەدا ئەوەیە كە تابوتەكەتان دێتەوە بۆ لاتان كە لەو تابوتەدا لەلایەن پەروەردگارتانەوە ئارامشی تێدایەو دەبێ بەهۆی دڵنیا بونتان لە راستی پێغەمبەرەكەتانو سەربەرزیو سەركەوتنی ئایینەدتان، وەپاش ماوەی ئالی موساو ئالی هارون كەبە جێماوە لێیان كە بریتی بو لە عەساو جلو بەرگی موساو هارونو وردە پارچەی ئەلواحی تێیدایە كە بێگومان لەوەدا بەڵگەیەكی گەورە هەیە بۆ ئێوە كە بزانن پێغەمبەرەكەتان راستەو فەرماندەیی تالوتیش دروستەو دەبێ ئیتر بە گوێی بكەن. ئینجا ئەو كەسانەی كە راست بون دوای ئەم رەخنە گرتنە ئامادە بونو لەشكرێك پێكهات بەڵام رەهبەری لێزانو شارەزا هەروا بە گۆترە خەڵكێك پێش خوێ نادات بۆ شەڕ بەڵكو تاقیان دەكاتەوە

فَلَمَّا فَصَلَ طَالُوتُ بِٱلۡجُنُودِ قَالَ إِنَّ ٱللَّهَ مُبۡتَلِيكُم بِنَهَرٖ فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ إِلَّا مَنِ ٱغۡتَرَفَ غُرۡفَةَۢ بِيَدِهِۦۚ فَشَرِبُواْ مِنۡهُ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۚ فَلَمَّا جَاوَزَهُۥ هُوَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ قَالُواْ لَا طَاقَةَ لَنَا ٱلۡيَوۡمَ بِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦۚ قَالَ ٱلَّذِينَ يَظُنُّونَ أَنَّهُم مُّلَٰقُواْ ٱللَّهِ كَم مِّن فِئَةٖ قَلِيلَةٍ غَلَبَتۡ فِئَةٗ كَثِيرَةَۢ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٢٤٩﴾ وَلَمَّا بَرَزُواْ لِجَالُوتَ وَجُنُودِهِۦ قَالُواْ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٥٠﴾ فَهَزَمُوهُم بِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَقَتَلَ دَاوُۥدُ جَالُوتَ وَءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَهُۥ مِمَّا يَشَآءُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّفَسَدَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٥١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّۚ وَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٥٢﴾

ئەوەتە لێرەش ئەم قیادە بەرێزە ئەو لەشکرەی خۆی تاقی دەکاتەوە وەك قورئان دەفەرموێ:

(٢٤٩) کاتێ کە تالوت سەربازەکانی جیا کردەوە بیری لە تاقیکردنەوەیەکی لەشکرەکەی کردەوەو وتی: بێگومان کە اللَّهُ ﷻ ئێوە تاقی دەکاتەوە بە روبارێك، جا هەر کەسێ لەو ئاوە بخواتەوە، ئەوسا ئەوەلە من نیەو با لەگەڵ ئێمەدا نەیەتو هەر کەسێکیش لەم ئاوە نەخواتەوە لە ئێمەیە مەگەر کەسێك یەك لامشت ئاو بخواتەوە، جا هەر کەسێك لەو لا مشتە(گوێل) زیاتر بخواتەوە نابێ لەگەڵ ئێمەدا بێت، جا کە گەیشتنە روبارەکە جگە لە کەمێکیان نەبێ هەمو لەو ئاوەیان خواردەوە، دەڵێن: ئەو لەشکرە هەشتا هەزار کەس بووە کە حەفتاو شەش هەزاریان گوێیان بە ئامۆژگاریەکەی (تالوت) نەداو بە کەیفی خۆیان ئاویان خواردەوەو چوار هەزاری لەگەل دا مایەوە، بەلکو وا مەشهورە کە سێ سەدو چەند کەسێکی بۆ مایەوە وەکو ژمارەی یارەکانی پێغەمبەر ﷺ لە بەدردا بە هەر حاڵ خوا دەفەرموێ: جا لەو کاتەدا کە خۆیو ئەو خاوەن باوەڕانەی کە لەگەڵیا بون تێپەڕین لەو روبارەو تەماشای کەمی خۆیانو زۆری دوژمنیان کرد وتیان: ئەمڕۆ توانای شەڕی جالوتو سەربازەکانی ئەومان نیە چونکە ئێمە کەمینو ئەوان زۆرن جالوت قیادەی کافرەکان بو، وە تالوتیش قیادەی خاوەن باوەڕان بوو، جا خوا دەفەرموێ: ئەوانەی یەقینیان بو کە بە خزمەتی خوای خۆیان دەگەنو حیسابیان لەگەڵ دا دەکات وتیان: زۆر جار کۆمەڵی بچوكو کەم بوە کەسەرکەوتوە بە سەر کۆمەڵی گەورەوزۆردا، بە چی؟ بە بڕیارو بە ئیزنی ﷻ اللَّهُ واتە مادام ئێمە بۆ خوا شەڕ بکەینو خوامان لەگەڵدا بێتو یارمەتیمان بدات ئیتر زۆریو کەمی گرنگ نیەو خۆ بگرن چونکە خوا لەگەڵ خۆگران دایەو لە کاتی پێویستدا یارمەتیان دەدات. ئینجا دەفەرموێ:

(٢٥٠) جا لە کاتێکدا کە کۆمەڵی بچوکی باوەڕداران بە قیادەی تالوت روبەڕوبوەوە لەگەڵ کۆمەڵی زۆری کافری خوانەناس دا بە قیادەی جالوت، باوەڕداران وتیان: خوایە لافاوی خۆگریو ئارامی برژێنە بەسەرمانداو پێمان محکەمو بتەو بکە کە وەقرە بگرینو یارمەتیمان بدەو زاڵمان بکە بە سەر گەلی کافران دا.

(٢٥١) بەڵێ پەروەردگار نزاکەی لێ وەرگرتن، جا بە ئیزنی خوا ئەو کۆمەڵە بچوکە ئەوانیان شکاندو داود کە ئەو کاتە سەربازێك بو لە ناو لەشکەری تالوت دا جالوتی کوشت کە قیادەو رەهبەری کافران بو، ئیتر ئەو لەشکرە گەورەیە تارو مار کراو ئەو لەشکرە بچوکەش سەرکەوتوانە درێژەی بە ژیانی خۆی داو خوای گەورەش نیشانەی ئازایەتیو شەهامەتی بە داود بەخشی ﷻ اللَّهُ پادشایەتیو دانایی پێداو کردی بە پێغەمبەر پاش شمویلو فێری ئەو شتانەی کرد کە خۆی ئارەزۆی لێ بو وەك لە سورەتی ئەنبیا/٨٠ دا دەفەرموێ: ﴿فێری دروستکردنی لیباسی زرێمان کرد بۆ ئێوە﴾و لە سورەتی سەبەئدا/١٠ دەفەرموێ: ﴿ئاسنمان بۆ نەرم کرد﴾ تا چۆنی ئارەزۆ لێ بێت بەو شێوەیە لیباسی لێ دروست بکاتو لە سورەتی ساد /١٨-١٩ دا دەفەرموێ:﴿ بە راستی ئێمە چیاکانمان رام کرد بۆ داود بۆ ئەوەی لەگەڵیا بە ئێوارانو بە بەیانیان تەسبیحاتی خوا بکەنو باڵندەکانیش کۆدەکرانەوە بۆیو لە هەوادا دەوەستانو لەگەڵ داودا تەسبیحاتیان دەکرد﴾

جا فەرمو پێم بڵێن کێ نیشانەو مەدالیای ئەوەندە بە نرخی وەرگرتوە؟ بە راستی ئیش هەر بۆ خوا بکەیت چاکەو بەرهەمەکەی زۆر بە نرخە خوایە وامان لێ بکەی هەر بۆ تۆو هەر لە بەر خاتری بەرز کردنەوەی ئایینەکەی تۆ ئیش بکەین، بەڵێ دروستکارو بەدیهێنەر ی ئەم جیهانە چاك دروستکراوی خۆی دەناسێت، ئەگەر بێت ئەم پارێزگاری ئایینە تەنها هەربە قسەی روت بێتو هیچی تر بەبێگومان ستەمکاران هەرگیز پاشە کشە ناکەنو ئەم زەویە هەمو پڕ دەبێت لە ستەمکاریو تاڵانو کوشتنو برینو داوێن پیسیو بەد رەوشتی وەك ئەمڕۆ دەبینین.

بۆیە دەفەرموێ: ئەگەر ﷻ اللَّهُ هەندێك لە خەڵکی بە هەندێکی تری لە بەین نەبات زەوی هەموی خراپ دەبوو جاری وایش هەیە ئەو شەڕانە لەسەر ئایین نین بەڵام ئەویش هەر چاکە چونکە

گەلێك مرۆڤی بێ ڕەوشتو ستەمكارو تاوانبار بەو شەڕە دەفەوتێنو خەڵك پشوویەكی ئارام دەداتو لە شەڕیان ڕزگار دەبێت. بەحەقیقەت خوا خاوەنی نیعمەتی زۆرە بە سەر هەموو عالەمدا. نەیفەرموە بە سەر موئمنان دا چونكە وەك وتمان: لە بەینی كافرانیش دا ﷻ شەڕ دروست دەكاتو كافران دەدات بە گژ یەكدا، چونكە ئەگەر هەروا بمێننەوە فەساد زیاتر دەبێت كەواتە ئەم جەنگە دەبێت بە هۆی بێ هێزی كردنی هەندێكیانو لە بەین چونی هەندێكی تریان" فلله الحمد فی الاولی والاخره" لەم داستانەدا ئەم شتانە وەردەگیرێت.

یەكەم ـ زوڵمو ستەمو تالانیو دەركردن دەبێت بە هۆی ڕاپەڕینو تۆڵە سەندنەوە زوو یان دێر، ئەوەتە ﴿ وتیان: چۆن ئێمە لە ڕێگای خوادا شەڕ ناكەین لەگەڵ ئەوەشدا كە ئێمە دەركراوین لە ناوماڵو خێزانی خۆمان؟ ﴾

دووهەم ـ پارێزگاری لە وڵاتو پاراستنی لەدوژمنانی موسڵمان ئەركێكی ئیسلامیەو جیهادی ڕێگای خوایە.

سێهەم ـ دەست بە سەرا گرتنی موڵكو ماڵی موسڵمانان حەرامەو شەڕ لەسەر كردنی جیهادە.

چوارەم ـ موسڵمانان داوای شەڕ نەكەن بەڵام هەر كاتێ شەڕ هاتە پێشەوە مەردانە ڕادەپەڕنو تەمەڵی ناكەن، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لَا تَتَمَنَّوْا لِقَاءَ الْعَدُوِّ وَسَلُوا اللَّهَ الْعَافِيَةَ فَإِذَا لَقِيتُمُوهُمْ فَاصْبِرُوا وَاعْلَمُوا أَنَّ الْجَنَّةَ تَحْتَ ظِلَالِ السُّيُوفِ / البخاري/ئاواتی شەڕو ڕووبەڕووبونەوەی دژمن مەخوازنو داوای خۆشی لەخوابكەن جائەگەر گەیشتن پێیان، ئەوسا خۆ بگرنو بزانن كەبێگومان بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێردایە}

پێنجەم ـ جیهاد پێویستی بە ڕەهبەرو قیادە هەیە،، موسڵمان نابێت بێگەورەو ڕەهبەربێت تەنانەت پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {إِذَا خَرَجَ ثَلَاثَةٌ فِي سَفَرٍ فَلْيُؤَمِّرُوا أَحَدَهُمْ /ابوداود، حسنه الالبا / ئەگەر سێ نەفر دەرچون بۆ سەفەر با كەسێكیان بكەن بە گەورەو ئەمیری خۆیان} جا ئەمە بۆ سەفەر ئاوامان پێ‌دەفەرموێ كەواتە بۆ ئیشێكی گرنگی وەك جیهاد دەبێت چۆن بێت، وە ئەم ڕەهبەرەش لە ئاسمان ناكەوێتەخوارەوە بەڵكو موسڵمانان دەبێت لەناو خۆیاندا بە ڕەچاوگرتنی مەرجەكانی ڕەهبەر، كەسێك لە خۆیان هەڵبژێرن.

شەشەم ـ مەرجی ڕەهبەر زاناییو بەدەن ساخیە نە نەژادو نە دەوڵەمەندی.

حەوتەم ـ نەبون یان كەمی ماڵو سامان نەكرێت بە بەهانە بۆ نەكردنی جیهاد ﴿هەر خوایە مالیكوموڵكی خۆی دەدات بە هەر كەسێك كە ئارەزۆی لێ بێت ﴾.

هەشتەم ـ پارێزگاری ئایین پێویستی بە زەحمەتو جیهاد هەیە نەك لە ماڵ دا دانیشتنو هەر بڵێی ﴿اللهم ادفع الظا بالظا ﴾؟! جا بەسالمینش ناوەستن دەڵێن: غانمین؟!

نۆهەم ـ پیاوانی موجاهید دەبێ تاقی بكرێنەوە تا ڕیزەكەیان پاڵفتە ببێت نەك هەر زۆرو بۆر بێت.

دەهەم ـ بەرژەوەندی نەكرێت بە بتو بپەرسترێت تەماشای ئەو هەموو تاقیكردنەوانە بكە كە كرا لەگەڵ ئەو خەڵكەی بەنی ئیسرائیلی دا﴿ بێگومان كە ﷻ ئێوە تاقی دەكاتەوە بە ڕوبارێك﴾.

یانزەهەم - سەركەوتنی موسڵمانان بە زۆریو كەمی نیە بەڵكو بە دەست خوایە.﴿ وتیان: زۆر جار كۆمەڵی بچوكو كەم بووە كەسەركەتوە بە سەر كۆمەڵی گەورەو زۆردا، ﴾

دوانزەهەم- مەرجێكی گرنگی تری سەركەوتن خۆگرتنە ﴿چونكە ﷻ لەگەل خۆگراندایە﴾ پێغەمبەریشمان دەفەرموێ: وَأَنَّ النَّصْرَ مَعَ الصَّبْرِ / ا د، صححه الالبا / بێگومان سەركەوتن لەگەڵ خۆ گرتن دایە.}

سیانزەهەم- مەرجێكی تریان پاڕانەوەو نزای موجاهیدانە لە كاتی دەست پێ كردنی شەڕدا كە ئەو كاتە یەكێكە لەو كاتانەی كە نزاو دوعا قەبووڵ دەبێت ئەمانیش ﴿وتیان: خوایە لافاوی خۆگریو ئارامی بڕژێنە بەسەرمانداو پێمان محكەمو بتەوبكە كە وەڕە بگرینو یارمەتیمان بدەو زاڵمان بكە بە سەر گەلی كافران ﴾

چواردەهەم- جیهاد كردن پارێزەری ئایینەو پێویستی بە ئەسباب هەیەو پێویستە ئەو ئەسبابانە بە گوێرەی توانای موسڵمانان ئامادە بكرێت وەك لە ئایەتی شەستی سورەتی ئەنفالدا هاتوە ﴿ئەوەی كە لەتواناتاندایە لەهێز ئامادەی بكەن...﴾ لێرەش قیادەو پێكهێنانی لەشكر ئەنجام درا ئینجا شەڕی پێكرا.

پانزەهەم- دروستە فەرماندەی موسڵمانان شتێكی زیادە بدات بەو كەسانەی كە لە ناو لەشكرەكەدا شتی گرنگو گەورە دەكەن وەك پێغەمبەرمانﷺ ئەفەرموێ: {وَمَنْ قَتَلَ قَتِيلًا فَلَهُ سَلَبُهُ/البخاري/هەر كەسێ كەسێكی كافر بكوژێت هەرچی پێیە بۆ ئەوە}

لێرەشدا خوای گەورە سەبارەت بە داود كە جالوتی كوشت دەفەرموێ:﴿ داود كە ئەو كاتە سەربازێك بو لە ناو ئەو لەشكەری تالوت دا جالوتی كوشت كە قیادەو ڕەهبەری كافران بو.. خوای گەورەش نیشانەی ئازایەتیو شەهامەتی بە داود بەخشی ﷻ پادشایەتیو دانایی پێداو كردی بە پێغەمبەر ﴾

شانزەهەم- شەڕو لێكدان سونەتێكی خواییەو دەبێ تا قیامەت ببێت بۆیە پێغەمبەریشمان دەفەرموێ:{ لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ قَالَ فَيَنْزِلُ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ فَيَقُولُ أَمِيرُهُمْ تَعَالَ صَلِّ لَنَا فَيَقُولُ لَا إِنَّ بَعْضَكُمْ عَلَى بَعْضٍ أُمَرَاءُ

۞ تِلْكَ ٱلرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۘ مِّنْهُم مَّن كَلَّمَ ٱللَّهُ ۖ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَٰتٍ ۚ وَءَاتَيْنَا عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَأَيَّدْنَٰهُ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ۗ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلَ ٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ وَلَٰكِنِ ٱخْتَلَفُوا۟ فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ وَمِنْهُم مَّن كَفَرَ ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا ٱقْتَتَلُوا۟ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿٢٥٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا بَيْعٌ فِيهِ وَلَا خُلَّةٌ وَلَا شَفَٰعَةٌ ۗ وَٱلْكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٥٤﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْحَىُّ ٱلْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُۥ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ مَن ذَا ٱلَّذِى يَشْفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذْنِهِۦ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَىْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ لَآ إِكْرَاهَ فِى ٱلدِّينِ ۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشْدُ مِنَ ٱلْغَىِّ ۚ فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَا ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥٦﴾

**تَكْرِمَةَ اللهِ هَذِهِ الأمة**/مسلم وغ ه/ هەمیشە بەشێك لەم ئوممەتەم لەسەرئایین شەڕ دەكەنو دیارن هەتا ڕۆژی قیامەت فەرموی: جاعیسای كوڕی مریەم ﷺ دادەبەزێت، ئەوسا ئەمیرەكەیان دەڵێ:وەرە ببە بەئیمامان، دەفەرموێ: نەخێر بەراستی دەبێ هەندێكتان پێشەوای هەندێكتان بن كە ئەمە ڕێزێكی خوایە بۆ ئەم ئوممەتە}

كەوابو جیهاد تا ڕۆژی قیامەت دەمێنێت لێرەش دا فەرموی: ﴿خوای گەورە ئەگەر هەندێك لە خەڵكی بە هەندێكی تری لە بەین نەبات زەوی هەموی خراپ دەبو ﴾ ئینجا دەفەرموێ:

﴿٢٥٢﴾ ئا ئەوەی كە باسمان كردو خوێندمانەوە هەموی نیشانەكانی خودان كەدەی خوێنینەوە بە سەرتا و بێگومان تۆ ئەی محمد ﷺ یەكێكی لە پێغەمبەران.

﴿٢٥٣﴾ ئەوانە پێغەمبەرانن كە ئێمە هەندێكمان بەرز كردوە بە سەر هەندێكیاندا هەندێكیان خودا قسەی لەگەڵ كردوە وەك موساو پێغەمبەرمانو ئادەم سەلاتو سەلامی خوا لە هەمویان، هەندێكیانی چەند پلەمان بەرز كردوەتەوەو بە عیسای كوڕی مریەم نیشانە گەلی ئاشكرای دا، ئەوە بو كە بە ئیزنی خوا مردوی زیندو دەكردەوە كوێرو كەچەڵی چاك دەكردەوە، هەروەها لە قووڕ تەیری دروست دەكردو فوی پێدا دەكردو گیانی تێ دەكەوتو زیندو ئەبوویەوە ئەوانە هەمویان نیشانەی ئاشكرا بون ئێمە یارمەتیمان دا بە ڕوح القدس، واتە: بە ڕوحێكی پیرۆز. ئایا ئەو ڕوحە پیرۆزە بو كە مردوی پێ زیندو دەكردەوە؟ یان مەبەست لەڕوح القدس جبرائیلە كە جبرەئیل پاڵپشتی بو یارمەتی دەدا. خۆ ئەگەر خوا ئارەزوی بكردایە هیچ كەس شەڕی نەدەكرد پاش هاتنی ئەوان چونكە ڕاستو ناڕاستیان بۆ جیا دەكردنەوەو لەسەر ڕاستیو دروستی خۆیان دەیان بەڵگەی ڕۆشنیان پێشان دەدان بەڵام ناكۆكی لە نێوانیان دا پەیدا بو، جا هەندێكیان باوەڕیان هێناو هەندێكیشیان كافر بون، دیارە ئەوان خۆیان ناكۆكیان دروست كرد، واتە: ئەگەر خوا ئارەزوی لێ بوایە نەی دەهێڵا نیزاع ببێ، بەڵام بڕیاری خوا لەسەر ئەوە نیە كە كەس بەزۆر موسڵمان بكات چونكە دروستبونی ئێمە لە دنیادا بۆنەمانی بەهانەیە، جا ئەگەر بە زۆر خەڵكی موسڵمان یان كافر بكات ئیتر سوود لە دروستبونی دنیامان دا نامێنێتو ئەو ئایەتانەی كە مانای ئەوە دەگەیەنن كە ئەگەر خوا مەیلی لێ بێت خەڵكی ڕێنمایی دەكاتو ئەی كات بە موسڵمان یان ئەگەر ئارەزوی لێ بێت هەر كەس هیدایەت بدات هیدایەتی دەداتو هەر كەسێكیش خوا گومڕای بكات كەس ناتوانێت هیدایەتی بدات ئەمانە ڕاستنو بەڵگەی كەمالی قودرەتو دەسەڵاتی خوداوەندن، بەڵام خوا بڕیاری داوە كە ئەوە نەكات، واتە: نە كەس بە زۆر موسڵمان بكات وە نە كەس بە زۆر گومڕا بكات بەڵكو مرۆڤی كردوە بە سەر پشكو خۆی دەتوانێ ڕێگا هەڵبژێرێ بۆ خۆی وەك لە ئایەتی بیستو نۆی ئەلكەهفدا دەفەرموێ:﴿جا هەر كەس ئارەزوی لێیە سا با باوەڕ بهێنێو ئەوەش كە ئارەزوی لێیە با كافرببێ﴾ بەڵام الله ﷻ هەرچی خۆی ئیرادە بكات دەیكاتو كەس ناتوانێت ڕێگای بگرێت، وە ئەم ئیرادەش دوو بەشە ئیرادەی كەونیو ئیرادەی شەرعی، جا بۆ ئەوەی چاكتر لەو ئایەتانە شارەزا ببیت ئەم چەند دێڕە سەبارەت بە ئیرادە دەنوسین چاكی بزانە بۆ ئاییندەت بە كەڵكە .

ئیرادەی خوای خاوەن دەسەڵات دوو بەشە:

**یەكەم** ـ ئیرادەی كەونی ئەم بەشە هەر چۆنێك خۆی ئیرادە دەكات وەها دێتە دیو كەمو زیادی نابێت.

**دووهەم** ـ ئیرادەی شەرعی كە ئەم بەشەی مەرج نیە بێتە دی جیاوازی نێوانیان بەم شێوەی خوارەوەیە

**الف** ـ ئیرادەی كەونی حەتمەن دێتە دی ئیرادەی شەرعی مەرج نیە بێتە دی

**ب** ـ ئیرادەی كەونی مەرج نیە خوا خۆی پێ خۆش بێت بەڵام لە بەر حیكمەتێك كە خۆی دەیزانێت ئەی كات وەك دروست بونی كوفرو شەیتان بەڵام ئیرادەی شەرعی، خوا پێی خۆشە وەك باوەڕهێنان.

ج ـ ئیرادەی کەونی خۆی مەبەست نیە بەڵکو لە بەر شتی تر مەبەستە وەك دروستبونی شەیتان ئەمە بە ئیرادەی کەونی خوا دروست بوە نەك لە بەر خاتری خۆی بەڵکو بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤە، بەڵام ئیرادەی شەرعی، هەر خۆی مەبەستە وەك رەوانە کردنی پێغەمبەرانو باوەڕ هێنانی خەڵك بەوان. بە کورتی هیچ شتێك لەم بونەوەرەدا بەبێ ئیرادەی خوا روونادات بەڵام دەبێ بزانین ئیرادەی خوا بەم شێوەیە کە باسمان کرد. بۆ نمونە — کوفری ئەبو جەهل ئیرادەی کەونی خوا بوە باوەڕی ئەبو بەکریش هەر ئیرادەی کەونی خوا بوە چونکە هاتوەتە دی‌و هەم ئیرادە شەرعیە چونکە خوا بەو بیرو باوەڕە رازیەو پێی خۆشە واتە هەردوو ئیرادە هەندێك جار یەك دەگرن‌و هەندێ جاریش لە یەکتر جیا دەبنەوە وەك کوفر بۆ کافران ئەمە هەر کەونیەو باوەڕ بۆ هەمو خەڵك ئەمەش ئیرادەشەرعیە بەڵام نایەتە دی بۆ هەمو خەڵك. ئینجا دەچینەوە سەر ئایەتێکی تر کە دەفەرموێ:

(٢٥٤) ئەی خاوەن باوەڕان شت ببەخشن لەوەی کە پێمان داون‌و ئەمانەتە لاتان لە پێش ئەوەی کە رۆژێك بێت کە نە مامەڵەو نە دۆستایەتی‌و نە شەفاعەتی تێدایە کە رۆژی قیامەتەو بە راستی هەر کافرانن ستەمکارن.

(٢٥٥) خودایەو هیچ پەروەردگارێکی تر نیە کە شایستەی پەرستن بێت بێجگە لە ئەو کە زیندووە هەمو شتێك کە گیانی تێدایە بە هۆی ئەوەوە دەژیت‌و سەرپەرستی هەمو شتێکەو هیچ شتێك بە بێ ئەو خۆی پێ راگیر ناکرێت نەخەوە نوچکە دەیگرێت نەدەخەوێت، چونکە خەو بۆ حەسانەوەیە خوا هەرگیز ماندو نابێت تا پێویستی بە خەو ببێت، بۆ خوایە ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەوی دایەو هەمو موڵکیەتی جا کێ هەیە بتوانێت شەفاعەت بکات لە لای خوا مەگەر بە ئیزنی خۆی وەك دەفەرموێ: ﴿مەگەر دوای ئەوەی کە ئیزن بدات بۆ کەسێك کە ئارەزۆی لێ بێت‌و رازی بێت﴾نەجم/٢٦

ئەمە قسەی ئەو کەسانە هەڵ دەوەشێنێتەوە کە دەڵێن: هەر کەس ئارەزۆی لێ بێت شەفاعەت دەکات بۆ هەر کەسێك کە خۆی بیەوێت، بەڵێ شەفاعەت هەیە بەڵام بەو مەرجانەی کە باسمان کرد، جا کەی ژیرانەیە کەسێك بە بۆنەی شەفاعەتەوە پشتوێنی لێ بکاتەوەو هیچ خۆی زەحمەت نەدات بۆ نمونە دەرمانی دژی زەهر هەیە جا کەی ژیرانەیە کابرا بڵێت من زەهر دەخۆم، چونکە دەرمانەکەی هەیە. ئینجا دەفەرموێ: ئاگای لە ئایندەو رابردویان هەیە، وەهیچ شتێك لە عیلمی خوا بە تەواوی نازانن‌و ئەو زانایەی کە مرۆڤ هەیەتی لە چاو زانایی خوا دا زۆر کەمە وەك لە سورەتی ئیسرا /٨٥ دا دەفەرموێ:﴿ئەوەی کە بە ئێوە دراوە لە زانستی هەر زۆر شتێکی کەمە﴾ ئینجا پاش باسکردنی فرەوانی زانینی باسی دروستکراوێکی گەورەی تر دەکات‌و دەفەرموێ: کورسیەکەی خوا لە ئاسمانان‌و زەوی گەورو فرەوانترەو پاراستنی ئاسمانان‌و زەوی بارێکی گران نیە لای ئەو زاتەو هەر ئەوە خاوەن شکۆو گەورەیە گەورەیەکی وایە کە هەمو گەورەکان لە بەر دەستیا بچوك‌و فەرمانبەرو داماون.

ئەم ئایەتە بەرێزترین ئایەتی قورئانەو بەناوبانگە بە(ئایەتەلکورسی)و چەندین فەرمودەی پێغەمبەرﷺ لە بارەیەوە باسکراوە. ئەسەحی ریوایەت ئەوەیە کە خوێندنی ئەم ئایەتە دەبێت بە هۆی دوور کەوتنەوەی شەیتان لە مرۆڤ کە لەم بارەوە داستانێکی مەشهور هەیە لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ کە بوخاری لە چەند جێگا باسی کردوە لێرەش ئەم ریوایەتەی ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی موسلیمتان بۆ باس دەکەین کە دەڵێت:{ عَنْ أُبي أن النﷺ سَأَلَه أي آيَةٍ فِي كِتَابِ اللهِ أعْظَمُ قَالَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ فَرَدَدَهَا مِرَارًا ثُم قَالَ أُبي آيَةُ الكُرْسِي قَالَ لِيَهْنِكَ العِلمُ أبا المُنْذِر وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إن لَهَا لِسَانًا وَشَفَتَيْن تُقدسُ المَلِكَ عِنْدَ سَاقِ العَرْش وَهَذَا لَفْظُ حَدِيثِ أُبي عَنْ عَبْدِ الرزاق /ا د ومسلم/ لە ئۆبەیی کوڕی کەعبەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لێ کرد کە ئایا دەزانی کام ئایەت لەو کتێبەی خوا کەلاتەگەورەترە لە هەموان؟ ئۆبەیی وتی: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن. چەند جارێك پێغەمبەر ﷺ ئەم پرسیارەی دووبارە کردەوەو لە پاش دا ئۆبەیی، وتی: وتم ئایەتەلکورسی. پێغەمبەرﷺ دای لەسەر سینگم‌و فەرموی: زانست تۆی لەخەم رەخساندوە پیرۆزت بێت ئەی باوکی مونزیر سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ئەو سوورەتە زمانێك‌و دوو لێوی هەیە کە لەلای قاچی عەرش دا یادی ئەوپادشایە دەکات}

بەم شێوەیە دەرکەوت کە ئەم ئایەتە ئایەتێکی گەورەی قورئانەو پێکهاتوە لە دە رستەی سەر بە خۆو پێنج ناوی خوای تێدایە کە لە راستی دا کۆکەرەوەی هەمو ناوەکانی خودان ( ٱللَّهُ، ٱلۡحَيُّ، ٱلۡقَيُّومُ ، ٱلۡعَلِيُّ، ٱلۡعَظِيمُ ) منیش داوا لەرۆڵەی موسڵمانان دەکەم کەلە بەری بکەن‌و پاش نوێژکان وکاتی خەوتنان‌و کاتی ترس بخوێنن چونکە ئایەتێکی زۆر گەورەیە بەسوودە،

لەئەبو ئومامەی باهیلیەوە هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {مَنْ قَرأ آيَةَ الكُرْسِي فِي دُبر كُل صَلاةٍ مَكْتُوبَةٍ لَمْ يَحِلْ بَيْنَهُ وَبَيْنَ دُخُول الجَنةِ إلاالمَوْتُ/ مسلم وغ ه/ هەر کەسێك لەپاش هەمو نوێژە فەرزەکان ئایەتەلکورسی بخوێنێت هیچ شتێك نابێ بەپەردە لەنێوان ئەو ولەنێوان چونە بەهەشتەوە جگە لەمردن}.

کورسی یەکێکە لەمەخلوقە گەورەکانی ﷲ، لەبارەی گەورەی ئەو مەخلوقەی خودا پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: {مَا السمَاوَاتُ

السبْعُ  ِ الكُرْسِي إلا كحَلْقةٍ بِأرْض فَلاةٍ وَفضْلُ الْعَرْش عَلى الكُرْسِي كَفضْل ِتلْكَ الفَلاةِ عَلىَ ِتلْكَ ا ُلْقَةِ /السلسلة الصحيحة/ هەر حەوت ئاسمانگەکان لەچاو کورسیدا وەك هەڵقەیەك وان لەناو دەشتێکداو گەورەیی عەرشیش بەسەر کورسیدا وەك گەورەیی ئەودەشتە وایە بەسەر ئەو هەڵقەدا}. وە ئیبنو عەباس دەڵێت: {الْكُرسي مَوضِعُ القَدَم ِ وَالْعَرْشُ لا َيقْدِرُ قَدْرَه إلا ا ُ َتعَا / قال الألبا : صحيح موقوفا/ کورسی جێگای هەر دوو پێی ﷲ یەو عەرشیش کەس ئەندازەی نازانێت جگە لە ﷲ} ئەمە قسەی سەحابیەکە لە بارەی شتێکی غەیبیەوە بێگومان قسەی ئەوانیش لە بارەی غەیبەوە حوکمی فەرمودەی گەیەنراو (**ا رفوع**) بە پێغەمبەری هەیە.

﴿مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ ﴾ بۆ لە مەو بەر لە مەو دوا مانا کراوە هەروەها ﴿وَمَا خَلْفَهُمْ ﴾ . ﴿سِنَةٌ﴾ وەنەوزە.

(٢٥٦) زۆر کردن نیە بۆ وەرگرتنی ئایین هەر کەس ئەبێ خۆی هەوڵ بداتو لە ئایین شارەزا ببێتو بە ئارەزۆی خۆی وەری بگرێت بە راستی چاكو خراپ رۆشن کراوەتەوە بۆ خەڵك. لێرەدا ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە بە زۆر ئایین ناسەپێندرێت بە سەر خەڵك دا بەڵکو دەبێ خەڵك بۆ خۆی بگات بە قەناعەتو باوەڕ بهێنێت ئەمە دژایەتی ئایەتەکانی جیهاد ناکات، چونکە مرۆڤ بێ سەرپەرستو یاسا ژیانی بۆ ناکرێت جا یا دەبێت یاسای خودا فەرمانرەوا بێت یان یاسای نەزانی، جا با هەر ناوێکی هەبێت وەك لە ئایەتی پەنجای سورەتی مائید دەفەرموێ: ﴿ئایا فەرمانی نەزانیتان دەوێت؟ کێ هەیە جوانتر لە خوا بێت لە لایەنی فەرمان دانانەوە بۆ گەلێك کە گەیشتبێتە دڵنیایی؟ ﴾

دەی بۆ فەرمانرەوایی یاسای ﷲ دەبێ جیهاد بکرێتو فەرمانەکانی ئەو جێ بە جێ بکرێت بەڵام بۆباوەڕ هێنان بەئیسلام کابرا بەدەست خۆیەتیو زۆری لێ ناکرێت، ئەگەر چی خوا رازی نیە بە کوفرو بێ باوەڕی. لێرەدا لەوانەیە بڵێن دەی ئەوە دیکتاتۆریە، لە وەڵا دا دەڵێین: هەمو خەڵك کومۆنیستی یان سۆسیالیستی یان دیموکراسی تۆیان قەبووڵ نیە ئەی تۆ بۆ ئەم هەمو ئاگرو ئاسنە بە کار دێنیت بۆ رام کردنی خەڵكو بە پەسەندیشی دەزانیتو لاڤی مرۆڤدۆستیو دیموراپش لێدەدەیت لەحاڵێکدا تائێستا ئەوەی کەئێوە ئەو هەموهاتو هاوارەی بۆدەکەن نەبوەو نەدێتە دی چونکە پەیرەوی کردنی ئارەزۆاتەو ئارەزۆکانیش هیچ کات یەك ناگرن کەواتە خەویکەو هەرگیز نایەتەدی؟ ئەی بۆ ئیسلام مافی ئەوەی نیە کەئەوەی بۆ بکرێت بە مەرجێك یاساکەی تۆ دەست کردی کۆمەڵێ خەڵكە کەخۆیشی ئاگای لە ئایندەی خۆی نیەو بە ئارەزۆی تاقمێکە، بەڵام یاسای ئیسلام هی دروستکەری خەڵکەو بۆ هەمو کەس وەکو یەك وایەو ئایندەی هەمو کەسیش دەزانێتو زیاتر لەهەزار ساڵ بەسەر ملیاردها مرۆڤدا فرمانرەوای کردوەو زێرین ترین کاتی مرۆڤایەتی ئەو کاتە بوە کە بە چاکی پەیرەوی کراوە، واتە دڵنیابن ئەوەی کەئێوە دەی پەرستن مافی پەرستنی نیەو دوای کڵاوی بابردو کەوتون بەڵام خوای داناو زاناو کار بەجێ کەتۆی لەهیچەوە هێناوەتە دنیاو ئەوهەمو جیهازو دەسگا گرنگو سەیرو سەمەرانەی پێداویتو پاشان دەتمرێنێ، ئینجا زیندویشت دەکاتەوە بۆ حیساب هەر ئەو مافی پەرستنی هەیە، بۆیە مەرجی باوەڕی راستەقینەش ئەوەیە کەبە تەواوی قەناعەتەوە خۆی پاڵ بەو هەمو خوا دەست کردانەوە بنێتو خوای راستەقینە بپەرستێت بۆیە دەفەرموێ: جا ئەو کەسەی کە کافر بێت بە تاغوتو باوەڕ بهێنێت بە خوا بەراستی ئەوە دەستی گرتوە بە دەستەیەکی زۆر بتەوو محکەمەوە کە سەرێکی لای ئەوەو ئەو سەرەکەی تری وا لە لای خوادا کە هەرگیز بچرانی نیەو دەگات بە خۆشیو خۆشبەختی هەر دوو دنیا، بەراستی خوا بیسەرو زانەرە بە ئیشەکان. (**الطاغوت**) واتە هەر شتێك بێجگە لە خوا بپەرسترێت ئیتر ئەو شتە گیان دار بێت وەك شەیتانو گەورەورەئیس خێڵەکان یان بێ گیان وەك پارەو مەقامو شورەتوگۆڕەکان، لە ترسا بێت وەك پەیرەوی کردنی رەئیسەکان یان لە خۆشەویستیدا بێت وەك پارەو ئافرەت هیچ فەرقی نیە، پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێ: {تَعِسَ عَبْدُ الدينَار وَالدِرْهَم وَالْقطِيفَةِ وَالْخَمِيصَةِ إنْ أعْطِيَ رَضِيَ وَإنْ لَمْ يُعْط لَمْ يَرْضَ / البخاري/ بمرێت بەندەی دینارو درهەمو پارچەی مەغمەڵی و پارچەی پۆشاك ئەگەر پێی درا رازییەو ئەگەر پێی نەدرا ناڕازیە} کەواتە پەرستن هەرمانای سوجدە بۆ بردن نیە، بەڵێ پەیرەوی هەر شتێك بکەیت یان یاساکەی قەبوڵ بکەیت ئەوە پەرستنە. جا ئەگەر پەیرەوی ﷲ و یاسای ئەوت کرد ئەوە بەندایەتی بۆ پەروەردگارت کردوە بەڵام ئەگەر شوێنکەوتوی یاسایەکی تر بیت ئەوە بەندایەتی جگە لە پەروەردگارت کردوە. سا تێبگە.

(٢٥٧) اللّٰە دۆستو یارمەتی دەری باوەڕ دارانەکە رزگاریان دەکات لە تاریکاییەکانەوە بۆ رۆناکی بەڵام ئەوانەی کە خوا ناناسن دۆستو یارمەتی دەرانیان تاغوتەکانن نەك رزگاریان ناکەن بەڵکو لە روناکی یەوە دەیان بەن بۆ تاریکاییەکان، جا تەماشا کەن چ ئەندازە جیاوازن وتراوە: ژیر ئەوەیە خۆی تەمێ بکات.

لێرەدا وشەی ﴿ٱلنُّورِ﴾ ی، بە تاك فەرموە بەڵام وشەی ﴿ٱلظُّلُمَٰتِ﴾ ی، بە کۆ فەرموە، (النور) واتە: رێبازی ئیسلام کە تەنها یەك رێگایە، وەك لە سورەتی ئەنعام دا دەفەرموێ: ﴿بێگومان ئەمەیە رێگای من کە راستە جا پەیرەوی بکەنو پەیرەوی رێچکەکانی تر مەکەن، چونکە بەش بەشتان دەکاتو دورتان دەخاتەوە لە رێگای خوا﴾

بەڵام لادان لە رێگای خودا چەندەها تاریکی دێنێت وەکو تاریکی عەقڵو تاریکی نەفسو تاریکی پەیرەوی کردنی شەیتانو تاریکی دنیا پەرستیو ستەم کاریو دەیان تاریکی تر کە بە هۆی لارێ بونو دوور کەوتنەوە لە ئایینی خودا توشی خەڵك دەبێت ئەمە تەنها لە دنیاداو لە رۆژی دوایشدا رۆژیان لەم رۆژانەی دنیا چاکتر نیە، وەك دەفەرموێ: ئەوانە هاوڕێی ئاگرنو بۆ هەمیشە لە ناوی دا دەمێننەوە. ئینجا اللّٰە داستانێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٥٨) وشەی (تَرَ) بە مانای بینینو زانین دێت، لێرە مەبەست دووهەمە، واتە: تۆ خەبەرت نیەو نازانیت کەچۆن ئەو کەسەی کە دەمە دەمەی کرد لەگەڵ ئیبراهیمدا لە بارەی خوای خۆیەوە، جا دەگونجێت ئەم (ه) هایە بۆ ئیبراهیم بێت لە بارەی خوای ئیبراهیمەوە یان بۆ کابرای دەم باز بگەڕێتەوە وەك مانامان کرد دەڵێن: ئەم کابرای دەم بازە نەمروود بووە خۆی بە خوا دەزانیو ئەم دەمبازیەشی لە بەر ئەوەبو کە خوا دەوڵەمەندی کرد بوو سەروەتو پاشایەتی پێ دابو جا لە خۆی بایی ببو دژایەتی ئیبراهیمی دەکرد لە بارەی خواوەو هەر خۆی بە خوا ئەزانی، ئەو کاتەی کە ئیبراهیم گوتی: خوای من ئەو کەسەیە کە زیندوو دەکاتەوەو دەش مرێنێت، دەڵێن ئەویش دوو نەفەری هێنا یەکێکیانی کوشتو ئەوی تریانی بەرەڵا کرد، وتی: منیش زیندوو دەکەمەوەودەشمرێنم، واتە: منیش مردن وژیانم لێدێت ئابەم شێوەیە ئیدعای خوایەتی دەکرد، ئینجا ئیبراهیم وتی: مادام تۆ بەم کارەت وا دەزانیت کە ژیانو مردن بە دەست تۆیەو هەموو گۆڕانکاریەکت پێدەکرێت، دەی اوا خۆر لە رۆژهەڵاتەوە دەر دەهێنێت تۆ ئەگەر راست دەکەیتو گۆڕانکاریت بە دەستە دەی لە رۆژئاواوە بیهێنەرەوە، ئەوسا ئەم خوا نەناسە ماتو داماو بوو هیچ وەڵامی بۆ نەمایەوە، بەڵێ مرۆڤێکی زاڵم بو، وە بە راستی

ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡلِيَآؤُهُمُ ٱلطَّٰغُوتُ يُخۡرِجُونَهُم مِّنَ ٱلنُّورِ إِلَى ٱلظُّلُمَٰتِۗ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٥٧﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِي حَآجَّ إِبۡرَٰهِـۧمَ فِي رَبِّهِۦٓ أَنۡ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ٱلۡمُلۡكَ إِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّيَ ٱلَّذِي يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا۠ أُحۡيِۦ وَأُمِيتُۖ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَأۡتِي بِٱلشَّمۡسِ مِنَ ٱلۡمَشۡرِقِ فَأۡتِ بِهَا مِنَ ٱلۡمَغۡرِبِ فَبُهِتَ ٱلَّذِي كَفَرَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥٨﴾ أَوۡ كَٱلَّذِي مَرَّ عَلَىٰ قَرۡيَةٖ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىٰ يُحۡيِۦ هَٰذِهِ ٱللَّهُ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۖ فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ قَالَ كَمۡ لَبِثۡتَۖ قَالَ لَبِثۡتُ يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۖ قَالَ بَل لَّبِثۡتَ مِاْئَةَ عَامٖ فَٱنظُرۡ إِلَىٰ طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمۡ يَتَسَنَّهۡۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰ حِمَارِكَ وَلِنَجۡعَلَكَ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِۖ وَٱنظُرۡ إِلَى ٱلۡعِظَامِ كَيۡفَ نُنشِزُهَا ثُمَّ نَكۡسُوهَا لَحۡمٗاۚ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥ قَالَ أَعۡلَمُ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٥٩﴾

خواش رێنمایی گەلی زاڵم ناکات.گەلێك کە زولمو ستەم بکات اللّٰە نایخاتە سەرە رێگای راست دەڵێن: ئەو کابرایە هەر باوەڕی نەهێناو بە هەمو هێزیەوە دژایەتی ئیبراهیمو ئایینەکەی کرد تا اللّٰە مێشوولەی زاڵ کرد بە سەریاو کوشتیو ناوو کرداری ئیبراهیمیش بو بە پاشماوەیەکی چاكو لای هەمو خەڵك مایەوە. ئینجا داستانێکی گرنگی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٥٩) ئایا هەواڵی ئەو کابرایەت پێ نەگەیشتوە کە بە لای گوندێکدا تێ پەڕی کە وێران ببوو دارو بەردی کەوتبو بەسەر یەکداو خەڵکەکەی هەمویان مرد بون، جا وتی: خوا ئەمانە چۆن زیندو دەکاتەوە؟ (پرسیار دەکات بۆ ئەوەی چۆنیەتی زیندوبونەوەی بۆ دەرکەوێت) جا خوا ئەو کابرایەی سەد ساڵ مراند، کە خۆرادنو خواردنەوەو گوێ درێژێکیشی پێبو بۆ سواری، پاشان زیندوی کردەوەو فەرموی: چەندێکە لێرەیت؟ وتی: رۆژێك یان تاقێکە من لێرەم، کاتێ تەماشای گوێدرێژەکەی دەکرد کە هەر ئێسقانەکەی مابو پێی وابو دەمێکە لێرەیە، بەڵام کە تەماشای خواردنەکەی دەکرد کە نەگۆڕابو پێی وابو کە زۆر نەماوەتەوە بۆیە وتی: تاقێکە. خوا فەرموی: نەخێر وانیە کە تۆ دەزانیت بەڵکوئەوە سەد ساڵە تۆ لەوێدایت، دەی بیر لە تواناودەسەڵاتی ئێمە بکەرەوەو تەماشایەکی خواردنو خواردنەوە کەت بکە کە هیچ گۆڕانکاریەکیان بە سەر دا نەهاتوە دەڵێن: ترێو هەنجیرو ئاوی مێوەی پێ بوە ئەمانە هیچ کامێکیان نەگۆڕا

بون، جا ﷲ له رێگای فریشتهوه پێ فهرمو: تهماشای گوێ درێژه كهت بكه كه چی لێ هاتوهو چۆنی درست دهكهینهوهو ئێمه تۆو به سهر هاتهكهت دهكهین به بهڵگهی زیندو كردنهوه بۆ خهڵكو تهماشای ئێسقانهكان بكهو بزانه چۆنی راست دهكهینهوه له پاشدا به گۆشت ئێسقانهكانی دا دهپۆشین دهڵێن: ئێسقانی ئهو گوێ درێژه به راستو به چهپ دا بڵاو ببو ئهوهندهی بهسهردا تێ پهڕیبوههموی سپی ببوهو ﷲ بایهكی نارد هەموی كۆكردنهوهو ههر پارچهیهكی له شوێنی خۆیدا داناو بو به گوێدرێژێكی ئێسقانیو له پاشدا خوا دای پۆشی به گۆشتو رهگو پێستو فریشتهیهكی نارد فوی كرد به ههردوو كونه لووتی داو كوتو پڕ سهڕاندی، ئهم كابرایه دهڵێن: عوزهیر پێغهمبهر بوه، جا كاتێ كه ئهم ههموشتهی به چاوی خۆی دی وتی: من دهزانم خودا دهسهڵاتی به سهر ههمو شتیك دا ههیهو لهم زهمانهدا كهس ئهو زانایيهی منی نیه چونكه من به چاوی خۆم زیندو كردنهوهم دیوه. ئهم داستانهی عوزهیر پێغهمبهر پهندو حیكمهتی زۆری تێ دایه بۆ زۆربهی خهڵكی نهفامو نهزانو لهدین تێنهگهیشتوو ئهوانهی كه له غهیری ﷲ هاوار دهكهنو دهپاڕێنهوه، پێیان وایه كه بهردێك یان دارێك یان قهبرێك یان پیاو چاكێك یان پێغهمبهرێك یان شێخێك وهڵامی داواكاریهكانیان دهداتهوه كاتێ كه بانگیان دهكهنو لێیان دهپاڕێنهوه، یان شیفای نهخۆشییهكهیان دهدات، یان داوای منداڵ له قهبرێك دهكهن (سبحان ﷲ) پاكو بێگهردی بۆ خوای تاكو تهنهاو بێ شهریكه، غهیری خوا كهس هیچ شتێك له پهنهانیهكان نازانێت. من ده پرسمو دهڵێم: ئایا ئهگهر پێغهمبهرێك خوای گهورهو خاوهن دهسهڵات سهد ساڵ بیمرێنێت، ئینجا دوای ساڵ زیندوی بكاتهوهو پرسیاری لێ بكات چهندێكه مردویت؟ وهڵام بداتهوه بڵێت خوایه رۆژێكه یان دانی رۆژێكه مردوم. جا ئهگهر كهسێك پێغهمبهری خوا بێت ولهههمو شێخێك شێختر بێتو وهلیو دۆستی ﷲ بێت سهد ساڵ بمرێت نهزانێت چهنده مردوهو ئهم سهد ساڵه ئاگای نه لهم دنیایهو نه لهو دنیایه بێت بهنهسی ئایهتی قورئان ئهی دهبێ بێجگه له خوای خاوهن دهسهڵات كێی ترهەبێت لهو گهورترو پایهبهرزتر ئاگای له داخوازییو پاڕانهوهكانی ئێوه بێت؟ قورئانی پیرۆز كه شهش ههزارو دووسهدو ئهوهنده ئایهته بهلای كهمییهوه شهش ههزار ئایهتی باسی عهقیدهیه، لهگهل ئهوهشدا زۆربهی ههره زۆری خهڵكی توشی سهدان جۆر نهخۆشی شیرك بوون! بۆ له قورئانهكهت ورد نابیتهوه؟ بۆ لهو خوایه ناپاڕێنهوه كه زیندووه نامرێ؟ بۆ له مردوو داوادهكهن؟ خۆ ئهگهر ئێوه دهڵێن ئهوانهی كه ئێمه داوای یارمهتیان لێ دهكهین ئهوانه واسیتهمان بۆ دهكهن لهلایهن ﷲ، ئایا تۆخۆت نازانی كه واسیته تهنها له حوكمی زاڵم دا ههیه؟ خۆ ﷲ سیفهتی زوڵمی نیه تا پێویست به واسیته بكات. سیفهتێكی ﷲ عهداڵهته، خۆ ههر حاكمێكیش عهداڵهتی ههبو پێویستی به واسته نیه ! جا باش بیر بكهرهوهو بزانه كه له ههر شوێنێكدا واسیته ههبو به یهقین زوڵم زاڵه بهسهر عهداڵهت دا. خۆ ئهگهر ههندێك بیر لهم قورئانه بكهیتهوه جا دهزانی موشریكانی سهردهمی پێغهمبهر ﷺ به دهقی ئایهتی قورئان كهسیان ئینكاری خوایهتی خوایان نهكردوه، ﷲ دهفهرموێ: ئهی محمدﷺ، پرسیار لهو موشریكانهی وهك ئهبو جههلو دارو دهستهكهی بكهوبڵێ كێ ئاسمانهكانو زهوی دروستكردوه؟ كێ بارانتان بۆ دهبارێنێ؟ ﴿ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ﴾ دهیان وت: ﷲ، بهڵكو موشریكهكان دهیان وت: ئهی محمد ﷺ ئێمه دهزانین ئهوانهی كه بانگیان دهكهینو لێیان دهپاڕێینهوه خوانین بهڵكوئهمانه تهنها واسیتهن له بهینی ئێمهو ﷲدا ﴿ ئێمه تهنهابهندایهتی ئهوان بۆ ئهوهدهكهین كه له ﷲ نزیكمان بكهنهوه﴾ زومهر/٣.

خۆ موشریكهكان حهجیان دهكرد، ههمیشهخزمهتی ماڵی خوایان دهكردو ئاویان به حاجیانی ماڵی خوا دهدا ، وهههمیشهیش نه تهنها تهوافی ماڵی خوایان دهكرد، بهڵكو بۆ تهوافیش لیباسیان لهبهرخۆیاندا نهدههێشتو دهیان وت: نابێت ئهو بهرگو لیباسهی كه ئێمه گوناهمان پێوه ئهنجام داوه تهوافی ماڵی خوای پێ بكهین، بهڕوتی تهوافیان دهكرد لهبهر زۆر رێزلێنان له ماڵی خوا ! دهی بۆچی به موشریك ﷲ ناویان دهبات؟ ئینكاری خواكردن كوفره، باوهڕبون بهخواو پهیڕهوی نهكردنی ههركوفرهوباوهڕبون بهخواو پهیڕهوی كردنی ههندێ لهویاسانهی كهبهسودی بێتو دژایهتی كردنی ههندێكی كه به سودی نهبێت كوفره، ناسینی خواو ئهنجامدانی فهرمانهكانیو سپاردنی ههندێ له تایبهتمهندییهكانی خوایهتی وهك منداڵ پێدانو شیفادانو زیادوكهمكردنی رۆزیو قوربانی بۆكردنو سپاردنی ئهمانه به غهیری خوا شیركهو پێی كافر دهبێت، جا ههر كهسێك بهو تاوانهوه بمرێت دۆزهخ بۆ ههمیشه جێگهیهتی. كهواته موشریك ئهوهیه باوهڕی به خوا ههیهو عیبادهتی خواش دهكات، بهڵام لهگهل خوا پهرستیهكهیشی دا پهنا بۆ غهیری خوا دهباتو هاوار له غهیری خوا دهكات و پێی وایه جگه له خوا سوودی پێ دهدات، خۆ تۆ كاتێ كه ئهو مردوه زیندو بو ئهگهر له دووری یهك كیلۆ مهتردا بانگت بكردایه نهبهدهمتهوهدههاتو نه گوێیشی لێت دهبو ، ئهی چۆن ئێستا كه مردوه ئاگای له تۆیه؟ ئهی نازانی بێجگه لهخوا كهس غهیب نازانێت، خۆ ئهوه سیفهتی خوایهتیه تۆ بهو كهسهی دهدهیت! ئهی خواناس بۆ بیر ناكهیتهوه؟! ئهی نازانی كاتێ كه ئیبراهیم پێغهمبهرعليه السلام مێوانی بۆ هات ئینجا

خواردنی بۆدانان، وتیان: ئێمە خواردن ناخۆین، ئینجا وتیان: بە ئیبراهیم ﷺئێمە فریشتەینو نێرراوین لەلایەن خواوە بۆ لەناوبردنی قەومی لوت پێغەمبەر ﷺ، جا ئیبراهیم ﷺ کەپێغەمبەرەو خلیل الله یە نەزانێت ئەوانە فریشتەن تا بە خۆیان خۆیان ئاشکرا نەکرد ئەی دەبێ چ کەسێ غەیەب بزانێتو چ کەسێك کەرامەتی هەبێتو لەلای الله لە ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ گەورەتر بێت؟ خۆ هەمان جەماعەت بون بە مێوانی لووتیش ﷺ بەلاَم نەی زانی کە ئەمانە فریشتەن تا خۆیان ئاشکرا کرد ! بۆ لووت پێغەمبەر ﷺ نەی زانیو کەرامەتی نەبو بەر لەوەی سەردانی ئەو بکەن کە جەماعەتێك مێوانن لە ماڵی ئیبراهیم پێغەمبەردان ﷺ؟!. ئەی نازانی کە ئەسحابو لکەهف وەلی الله بون، الله سێ سەدو نۆساڵ خەواندنی، جا کاتێ کە خەبەری کردنەوە پرسیاریان لە یەکتر دەکرد چەندێکە نوستوین هەندێکیان وتیان: رۆژێکەو هەندێکی تر وتیان: تاقێکە. بۆ بیر ناکەیتەوەو لە قورئانەکەی خۆت وردبیتەوە کە هیچ گومانی تێ دانیە؟! ئەی الله ی خاوەن دەسەڵات بۆ ئەم هەمو نموونانە باس دەکاتو دەی هێنێتەوە لە قورئان دا؟ ئایا تەنها حکایەتەو بۆ گوێ گرتنو خۆشیە وهیچی تر؟ بەدەیان نموونەی تر دەتوانی هەرلەم قورئانەدا دەر بهێنیو بیری لێ بکەیتەوە. هەمو ئەمانە کە باس دەکرێت تەنها بۆ ئەوەیە کە بەتەنهایی خوا بپەرستیو هەر داواکارییەکت هەیە تەنها داوا لەو بکەیتو دەسەڵاتی رەها تایبەتی خوایەو هیچ کەسی تر ئاگای لە هیچ نیەو هیچی پێ ناکرێت مەگەر بەئیزنی خوا بۆکەسێك کەلێی رازی بێت.

ئایا دەزانیت ئەگەر پێت وابێ کە جگە لەخوا کەسێ لەبارەی شتە نهێنیەکانتەوە زانیاری هەیەو ئاگای لە پێویستیەکانو داواکاریەکانی جەنابتە، لەگەڵ قەدەری خوادا هاوتاناتەوە؟ ئەگەر بڕیار بێت هەر پیاو چاکێکو مشایخێکو پێغەمبەرێك کە بەداخەوە رۆژانە بە مەلاین خەڵك رویان تێ دەکەنو داوای ئەنجامدانی پێویستیەکانیان لێ دەکەن، ئەگەر ئەوانە دەورێکیان هەبێو هەرکەسەو ئیشی خۆی بکات، قەدەری کەونی لە کار دەکەوێت، جا ئەگەر ئەوانە دەوریان هەبێو هەرکەسێك واسیتە بۆ خەڵکێك بکات، ئەی ئەم هەمو تاقی کردنەوەی مرۆڤەسودی چیە لە دنیادا؟ تۆزێك بیر کەرەوەو تەپوتۆزی خەرافیاتو شیرك لەخۆت بتەکێنە، چونکە تاوانێکی زۆر گەورەیەو جۆری زۆرەو هەندێکی زۆر نهێنیەو پێغەمبەرمان ﷺ لەخواپاڕاوەتەوە کەلە هەمو جۆرەکانی شیرك بیپارێزێت، ئەی خەڵکینە بەڵێنی خوا حەقەو دەفەرموێت لەوانەیە لە هەمو گوناهێك خۆش ببم، بەلاَم لە شیرك هەرگیز خۆش نابم. شێخ عبدالقاری گەیلانی رەحمەتی

وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِـۧمُ رَبِّ أَرِنِي كَيۡفَ تُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ قَالَ أَوَلَمۡ تُؤۡمِنۖ قَالَ بَلَىٰ وَلَٰكِن لِّيَطۡمَئِنَّ قَلۡبِيۖ قَالَ فَخُذۡ أَرۡبَعَةٗ مِّنَ ٱلطَّيۡرِ فَصُرۡهُنَّ إِلَيۡكَ ثُمَّ ٱجۡعَلۡ عَلَىٰ كُلِّ جَبَلٖ مِّنۡهُنَّ جُزۡءٗا ثُمَّ ٱدۡعُهُنَّ يَأۡتِينَكَ سَعۡيٗاۚ وَٱعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٢٦٠﴾ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتۡ سَبۡعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٖ مِّاْئَةُ حَبَّةٖۗ وَٱللَّهُ يُضَٰعِفُ لِمَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٦١﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ لَا يُتۡبِعُونَ مَآ أَنفَقُواْ مَنّٗا وَلَآ أَذٗى لَّهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٢٦٢﴾ ۞ قَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞ وَمَغۡفِرَةٌ خَيۡرٞ مِّن صَدَقَةٖ يَتۡبَعُهَآ أَذٗىۗ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٞ ﴿٢٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُبۡطِلُواْ صَدَقَٰتِكُم بِٱلۡمَنِّ وَٱلۡأَذَىٰ كَٱلَّذِي يُنفِقُ مَالَهُۥ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ صَفۡوَانٍ عَلَيۡهِ تُرَابٞ فَأَصَابَهُۥ وَابِلٞ فَتَرَكَهُۥ صَلۡدٗاۖ لَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّمَّا كَسَبُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٦٤﴾

خوای لێ بێ کە یەکێك بو لە بەندە ساڵحەکانی خوا سەری خۆی لەسەر تایەرە بەردەکانی کەعبە دادەناو دەگریاو هاواری لە الله دەکردو دەی وت: خوایە ئەگەر لە گوناهەکانی عبدالقادر خۆش نابیو لە رۆژی قیامەتدا بەو هەمو گوناهانەوە حەشرم دەکەی خوایە بە چاو کوێری حەشرم بکە لەبەر شەرمەزاری گوناهەکانم تا خەڵکی نەبینم! وریابە سەدو بیستو چوار هەزار پێغەمبەر رەوانە کراوە تەنها بۆ ئەوەی کەخەڵك خوای خۆی بەتاکیو بێ هاوتا بناسێتو روو لە خوای خۆی بکات. ئینجا الله داستانێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٢٦٠﴾ باس بکە ئەو کاتەی کە ئیبراهیم ﷺ وتی: ئەی پەروەردگارم چۆن مردو زیندو دەکەیتەوە تێم بگەیەنە تا بە چاوی خۆم بیبینم؟ الله فەرموی: ئایا تۆ هێشتا باوەڕت نیە کە من مردو زیندو دەکەمەوە وتی: خوایە من باوەڕم هەیە کە تۆ مردو زیندو دەکەیتەوە بەلاَم حەز دەکەم بۆ ئەوەی دڵم بە تەواوی ئارام بگرێت شتێك بێت بە چاوی خۆم بیبینم و ئەو(علم الیقین)ـە ببێت بە (عین الیقین) بۆم. بەڵێ لەراستیدا ئیبراهیم ﷺ بەم پرسیارە باری سەرشانی خۆی قورس کرد ئەوەبو الله فەرموی: دەی چوار باڵندە بگرەو چاك تەماشایان بکەو بیان ناسەو سەریان ببڕە لە پاشدا وردیان بکە بەناو یەکداو بیانکە بەچەند بەشێکەوەو هەر بەشێکیان لەسەر چیایەك دابنێ جا ئیبراهیمیش ﷺ ئەو چوار باڵندەیەی هێناو پاش ناسینێکی باش

سەری برینو پەڕەکانی لێ کردنەوەو وردی کردن بە سەر یەکداو کردنی بە چوار بەشەوە لەسەر چوار چیا یان حەوت بەش لەسەرحەوت چیا دانیان ، لە پاش دا خوا فەرمووی: بانگیان بکە بە پەلە دێن بۆ لات ئەویش بانگی کردن، جا دیی هەر پەڕێ بۆ لای پەڕێکی ترو هەر خوێنێك بۆ لای خوێنێکی ترو هەر گۆشتێك بۆ لای گۆشتێکی تر دەفڕێت، دەڵێن سەری هەر چوار یان لەلای خۆی بوە دی هەر چوار لاشەکە تەواو ڕێكو پێك بونو بێ سەر هاتنە لای جائەو هەر کاتێ کە دەیویست سەری یەکێکیان لەسەر لاشەی یەکی تریان دابنێت ئەو لاشەیە وەری نەدەگرت بەڵام هەر کە سەری خۆی لەسەر دادەنا گورج وەکو خۆی لێ دەهاتەوە جابەم شێوەیەئیبراهیم (عليه السلام)، کە خۆی ئوممەتێکی تەواوو مامۆستای تەواوی یەکتاپەرستانە بەچاوی خۆی زیندوبونەوەی بینیو دڵو دەرونو عەقڵی خۆی جارێکی تر بە بێ سنوری زاناییو تواناییو دانایی پەروەردگاری خۆی زاخاودایەوەو داستانێکی ڕاستودروستی زیندوبونەوەشی بۆپاش خۆی تۆمارکرد. کۆتایی ئایەتەکەش دەفەرموێ: دەی بزانە بە ڕاستی خودا خاوەنی دەسەڵاتەو ئیشەکانیشی دانایانەیە. لە بارەی جۆری ئەم باڵندانەوە قسەی جیا جیا کراوە بەڵام ئەوە شتێکی زۆر گرنگ نیە ئەگەر گرنگ بوایە خوا باسی دەکردن، جاهەندێك دەڵێن: باڵندەیەکی ڕەشی ئاویو تاوسێكو کەڵەشێرێكو کۆترێك بوەو هەندێکی تر دەڵێن: مراوییەكو بەچکەی نوعامەو کەڵەشێرێكو تاوسێك بوەو هەندێکی تر دەڵێن: کۆترێكو کەڵەشێرێكو تاوسێكو قەلە ڕەشەیەك بوە. بەم شێوەیە ئەم داستانە بە نرخە کۆتایی دێت، ئینجا باسی ماڵبەخشینو خەرجکردنی لە ڕێگای بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلامman بۆ دەکاتوتێمان دەگەیەنێ کەئیسلام بەهەمو بەشەکانی دەوترێو کۆی هەمویان دەکاتە ئیسلامو بەشبەشی تێدا دروستنیەو دەفەرموێ:

(٢٦١) وێنەی ئەو کەسانەی کە ماڵیان دەبەخشن لە ڕێگای خوادا وەك دنکە تۆیەکە کە حەوت گوڵ سەوزبکاتو لە هەر گوڵێکدا سەد دانەی تێدابێ کەدەبێ بە حەوت سەد دانەو خوا دوو بەرامبەریشی دەکاتەوە بۆ کەسێ کە ئارەزۆی لێ بێت، وە خوا شتی زۆری هەیەو زانەرە بە هەمو ئیشەکانی مرۆڤ. واتە بە خشین بۆغەزا لای کەمی حەوت سەد بەرامبەرە وەك لەم فەرمودەشدا هاتوە کە ئەبو مەسعود دەڵێت: {أن رَجُلًا تَصَدقَ بِنَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ فِي سَبِيلِ اللهِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لَيَأْتِيَن يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِسَبْعِ مِائَةِ نَاقَةٍ مَخْطُومَةٍ / ا د، النسائي. صححه الالبا / جارێکیان پیاوێك حوشترێکی هێنا بۆ پێغەمبەر ﷺ بەزینو لەغاوەوە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:بەدڵنیاییەوە ﷲ حەوسەد حوشتری بەم شێوەیەت پێ دەدات لە قیامەت دا }بێگومان خوا خاوەنی نیعمەتی زۆرو بێ ژمارەو زۆریش بەخشندەیەو بەخشینەکانیشی هیچ شتێك لەموڵکی ئەو کەم ناکاتەوە وەك لەم فەرمودە قودسیەدا هاتوە کەدەفەرموێ: {يَا عِبَادِي لَوْ أن أولكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَألُونِي فَأَعْطَيْتُ كُل إِنْسَانٍ مَسْألَتَهُ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِما عِنْدِي إِلا كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ /مسلم/ ئەی بەندەکانم ئەگەر هەموتان بە مرۆڤو جنۆکەوە لەدەشتاییەکی بەرزدا کۆببنەوەو هەرچی بە خەیاڵی خۆتان دا دێت داوای بکەن، جابەهەمو یەکێکتان ئەوەی کە داوای دەکەن پێتان ببەخشم لەوەی کە لەلای منە هەرئەوەندە کەم دەکاتەوە کە دەرزیەك بکەیت بە ناو دەریایەکدا لە پاشدا دەری بهێنی ئەم دەرزیە چەند لەگەڵ خۆی ئاو هەڵگرێو چەندێ ئاوی ئەودەریایە کەم بکاتەوە هەر ئەوەندەش لە نیعمەتی من کەم دەبێتەوە} ئینجا دەفەرموێ:

(٢٦٢) بەڕاستی ئەوانەی کە ماڵیان لە ڕێگای خوادا دەبەخشنو مەبەستیان تەنها ڕەزامەندی خوایە لە پاشدا لەسەر ئەو ماڵ بەخشینە هیچ منەت ناکەن بە سەر کابراداو ئازاری نادەن بۆئەوان پاداشتیان هەیە لە لایەن پەروەردگاریانەوەو هیچ ترسێك نیە بۆیانو ئەوان خەفەت ناخۆنو سەربەرزن لەو ڕۆژەدا کە خەڵك خەفەت دەخوات. ئینجا ئەگەر ئەو ڕێبازە جوانەی نەگرتە بەر بەڵکو کابرای بەخشندە منەتی دەکرد بەسەر کابرای پێ بەخشراو داو ئازاری دەدا ئەوە ئەو چاکەیە نەکات باشترە وەك دەفەرموێ:

(٢٦٣) قسەیەکی چاكو چاوپۆشی کردن لە هەڵەیەك باشترە لە چاکەیەك کە ئێشو ئازاری بەدوادابێت، خوا دەوڵەمەندەو نیازی بە یارمەتیو بەخشینی ئێوە نیەو ئەوەی کە دەیبەخشن بە سودی خۆتانە، جائەگەر لەسەر ئەورەفتارە خراپەتان بەزوی تۆڵەتان لێ وەرناگرێت لەبەر ئەوەنیە کەرەفتارەکەت چاکە نەخێر بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە ﷲ سبحانه وتعالى بە حەوسەڵەیە، جا وریابە لەحەوسەڵەی ئەوکەڵکی خراپ وەرنەگریت چونکە تۆڵەکەشی سەختە.

واتە قسەیەکی جوانوڕێنمای بکە بۆئیشێکی باش چاکترە لەو جۆرە چاکە ئازاردەرانە ﷲ بێ نیازەو تۆ چاکە بۆخۆت دەکەیتو پێویستە بە حەوسەڵەش بیت ئەگەر ئەوکابرایەی کەچاکەی لەگەڵدا دەکەیت ڕەفتاری لەگەڵتا جوان نەبو تۆچاکەی خۆت بە منەتو ئازار دان هەڵنەوەشێنیتەوە چونکە چاکەی مرۆڤ پێشەکی بە دەستی ﷲ دەگات ئینجا دەکەوێتە دەستی چاکە لەگەڵکراودا. لە ئەبوهورەیرەوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إن اللهَ يَقْبَلُ الصدَقَةَ وَيَأْخُذُهَا بِيَمِينِهِ فَيُرَبيهَا لِأَحَدِكُمْ

كَمَا يُرَبِي أحَدُكُمْ مُهْرَهُ حَتى إن اللقْمَةَ لَتصِيرُ مِثْلَ أُحُدٍ /الترمذی. صححه الالبا / بەبێگومان کە ﷲ چاکە بەدەستی راستی وەردەگرێت جاگەورەی دەکات بۆ ئێوە وەك چۆن ئێوە بەچکەی حوشتر گەورە دەکەن تا یەك پاروو چاکە وای لێدێت وەك چیای ئوحد}بەراستی باسکردنی ئەم دووسیفەتە بەرزە لێرەدا زۆر کاری گەرە لەدڵی مرۆڤی خواناسدا جا با چاکە کار بە پەلە نەبێت بۆ پاداشتەکەی بەڵکو پێویستە بە حەوسەڵە بیتو پێویستە چاکە لەگەڵکراویش سوپاسی چاکەکار بکات. وەك هاتوە کە: {ئەگەر کەسێك چاکەی لەگەڵدا کردی هەوڵ بدە پاداشتی بدەرەوە بە شێوەی چاکەکەی، خۆ ئەگەر نەت توانی، دەی ئەوەندە دوعای خێری بۆ بکە بە ئەندازەی چاکەکەی} بەڵێ ئیسلام ئاوەها فەقیرو دەوڵەمەند ئەلکینێت بە یەکەوەو برایەتیان لە نیوان دا دروست دەکات ئیتر ئەمە دەبێ بە هۆی ئەوەی کە چاکەکان هەڵنەوەشێننەوە وەك دەفەرموێ:

(٢٦٤) ئەی باوەڕداران چاکەی خۆتان بەتاڵ نەکەنەوە بە منەتو ئەزیەت دان چونکە چاکە کردن ئەگەر منەت نانی تێدا بێ بەتاڵ دەبێتەوە وەك ئەو کەسانە وایە کەماڵیان دەبەخشن بۆروپاماییو لە بەر چاوی خەڵك تا بڵێن کابرایەکی سەخیە، جا ئەمە باوەڕی بە خواو بە رۆژی دوایی نیە کە پاداشت وەردەگرێتەوە بەڵکو تەنها بۆ دنیا ئەوچاکەیە دەکات ئەوسا وێنەی ئەو کابرایە وەك بەردێکی ساف وایە کە هەندێك خۆڵی لەسەر بێتو بارانێکی توند لێی بدات چەندێك لەو خۆڵە دەمێنێتەوە لەسەر ئەو بەردە سافە ئەو کابرایەش هەر ئەوندە چاکەی بۆ دەمێنێتەوە، ئاشکرایە کە هیچی بە سەرەوە ناهێڵێتەوە واتە ئەو کابرا منەت نەرو ئازار دەرەیش چاکە کەی بە فیڕۆ دەچێتو هیچیان لەو چاکەیە کە کردویانە دەست ناکەوێتەوە وەك دەفەرموێ: ئەوانە توانایان نابێت هیچ شتەك پەیدا بکەن لەوەی کە کەکردویانە، بەم شێوەیە ئەمانە زوڵمیان لە خۆیان کردوە بە هۆی بێ باوەڕیانەوەو کافرنو خودایش هیدایەتی گەلی کافران نادات.
ئینجا وێنەیەکی چاکەکارانی چاکمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٦٥) وێنەی ئەو کەسانەی کە ماڵی خۆیان دەبەخشن بە کەمدەستانو نیازمەندان لە بەر خاتری رەزای خواو بۆ بتەوکردنی ئەورەزامەندیە لە دڵیانداو ئارامگرتنودڵنیابونیان بە پاداشت، ئەو چاکەیە ئەبێت بە هۆی قەرار گرتنی دڵیان لەگەڵ خوادا چونکە ئەم جۆرە بەخشینە یادو زیکری خوایەو لە بەر فەرمانی خوایە ئاشکرایشە ئەگەر مرۆڤ عیبادەتی کرد بۆ خوا زیاتر دڵی ئارام دەبێت. جاوێنەی چاکەی ئەوچاکە کارە وەك باخچەیەك وایە لە شوێنێکی بەرزدا بێت کە هەمیشە بارانی زۆر

وَمَثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمُ ٱبْتِغَآءَ مَرْضَاتِ ٱللَّهِ وَتَثْبِيتًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ كَمَثَلِ جَنَّةٍۭ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَـَٔاتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ فَإِن لَّمْ يُصِبْهَا وَابِلٌ فَطَلٌّ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ (٢٦٥) أَيَوَدُّ أَحَدُكُمْ أَن تَكُونَ لَهُۥ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ لَهُۥ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَأَصَابَهُ ٱلْكِبَرُ وَلَهُۥ ذُرِّيَّةٌ ضُعَفَآءُ فَأَصَابَهَآ إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَٱحْتَرَقَتْ ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ (٢٦٦) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنفِقُوا۟ مِن طَيِّبَٰتِ مَا كَسَبْتُمْ وَمِمَّآ أَخْرَجْنَا لَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ ۖ وَلَا تَيَمَّمُوا۟ ٱلْخَبِيثَ مِنْهُ تُنفِقُونَ وَلَسْتُم بِـَٔاخِذِيهِ إِلَّآ أَن تُغْمِضُوا۟ فِيهِ ۚ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ (٢٦٧) ٱلشَّيْطَٰنُ يَعِدُكُمُ ٱلْفَقْرَ وَيَأْمُرُكُم بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ وَٱللَّهُ يَعِدُكُم مَّغْفِرَةً مِّنْهُ وَفَضْلًا ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (٢٦٨) يُؤْتِى ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِىَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ (٢٦٩)

لێی بدات جا بەرو بومی ئەم باخچەیە دوو بەرابەری باخچەی وێنەی خۆی بێت خۆئەگەر بارانێکی زۆرو گەورەش لێی نەدات هەمیشە بارانی وورد لێی بداتو بێ بڕانەوە ئاوی ببێت ئاشکرایە کە ئەو باخچەیە لە باخچەکانی تر بەروبومی زیاترو بە خێرترەو هەمیشە بەرهەمی جوانی دەبێت.
هەر بەم شێوەیەش ئەو کەسانەی کە چاکە دەکەن لە بەر خاتری ﷲ هەرگیز بڕانەوەی نیەو هەمیشە لە زیاد کردن دایەو بە راستی خوا بەوەی کە ئێوە دەیکەن بینەرەو هیچی لێ ون نابێت نە چاکەو نە خراپە با لە گەردیلەیەکیش بچوك تر بێت. ئینجا سەبارەت بەو کەسانەی کە کرداری خۆیان خراپ دەکەن، بە نمونەیەك دەیخاتە پێش چاومانودەفەرموێ:

(٢٦٦) ئایا هیچ کام لە ئێوە پێی خۆشە کە باخچەیەکی لە خورماو لە ترێ هەبێت کەبەناویدا چەندین روبار بڕوات کەلەو باخچەیەیدا هەمو مێوەیەکی هەبێتو لەهیچی کەم نەبێت و کابرا پیر بوبێتو منداڵانێکی لاوازو بێ هێزی هەبێت ئینجا ئا لەو کاتەدا بایەك بە گڕەوە لێی بداتو بسوتێت؟ کێ شتی وای پێخۆشە؟
ئەم وێنەیە بۆ ئەو کەسانەیە کە لە سەرەتاوە مرۆڤی باشنو ئیشی باش دەکەن لە پاشان پاشگەز دەبنەوە ئینجا لەو کاتەدا کە پێویستی بە بەرهەمی کردارو وتارەکانی هەیە کە رۆژی قیامەتە هیچی بۆ نەمێنێتەوە هەروەك کابرای پیر کە تازە توانای باغ

دانانی تری نەماوە ئەمیش تازە کاتی ئیش کردنی نەماوەو هیچی بۆ ناکرێت جا چ زیانێك و چ سەرشۆڕیەك هەیە لەو زیان و سەر شۆڕیە گەورەترو پڕ مەترسی تر؟

بۆیە پێویستە موسڵمانان هەمیشە لە دوا ڕۆژی خۆیان بترسن و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر ئیخلاس و تەقوایان هەبێت چونکە ئایندە نەزانراوەو خواش گۆڕێنەری دڵەکانە.

ئەنەس ﷺ دەڵێت: {كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُكْثِرُ أَنْ يَقُولَ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ آمَنَّا بِكَ وَبِمَا جِئْتَ بِهِ فَهَلْ تَخَافُ عَلَيْنَا قَالَ نَعَمْ إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ. / رواه الترمذي. صححه الالباني / پێغەمبەر ﷺ زۆر جار دەی فەرمو: ئەی کەسێك کەدڵەکان دەگۆڕیت دڵم دامەزرێنە لەسەر ئایینەکەت. جا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمەبە تۆو بەئەوی کەهێناوتە، باوەڕمان هێناوە، جا ئایا ترسی ئەوەت هەیە کە پاشگەز ببینەوە، فەرموی: بەڵێ، بەراستی دڵەکان لە بەینی دوو ئەنگوستی الله دایە هەرچۆن ئارەزۆی لێ بێت ئەم دیو دیوی دەکات} ئەوە نموونەیە کە لەم ئایەتەدا باس کراوە بۆ ئەو کەسانەی کە پاشگەز دەبنەوەو دەفەرموێ: هەر ئاوەها خوای گەورە نیشانەکانی خۆی ڕۆشن دەکاتەوە بۆتان تا ئێوەش بیر بکەنەوەو ئامۆژگاری لێ وەرگرن. ئینجا لەبارەی چۆنیەتی بەخشینەوە دەفەرموێ:

(٢٦٧) ئەی باوەڕداران ببەخشن لەوشتە پاکانەی کە بەدەستتان هێناوە، واتە ئەوەی کە دەیبەخشن شتی پاك و حەڵاڵ بێت. چاکەو خێر تەنها بەماڵی حەڵاڵ دەبێت هەروەك لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە کە: {أيها الناسُ إن الله طيبٌ لا يَقْبَلُ إلا طَيِّبًا / مسلم وغيره/ ئەی خەڵکینە بە ڕاستی خوا پاکەو هەر پاکیش وەردەگرێت}

لەوانەی کە ئێمە لە زەویدا بۆمان دەرهێناون ئیتر ئەمە گشتیەو هەموو شت دەگرێتەوە لە دانەوێڵەو مێوەو بەرهەمی کانەکان، دەی ئێوە نەچن شتی خراپ ببەخشن ئەوەندە بێ قیمەتبێت ئەگەربەخۆتان بدرێت وەری نەگرن مەگەر چاوپۆشی تێدا بکەن ولەشەرما وەری بگرن،

دەڵێن یارەکانی مەدینەیی پێغەمبەر ﷺ ئەوانەی کە خورمایان هەبو هەر کەسێك دەچوو لقێك خورمای دەبڕی و دەیهێنا بۆ مزگەوت، جەماعەتێکی تر لە یارە کۆچەرەکان لە مزگەوت دا هەبون ئەوانیش هەر کاتێك برسیان دەبو دەچون داریکیان لێ دەداو ئەوەی کە دەوەری دەیان خوارد هەندێکیش دەچوون ئەو لقانەی کە خۆیان دەشکان بە هۆی باوەوباش نەبو دەیان هێنا بۆ مزگەوت و دەیان وت: هەر خێرەو بە داریان دا دەکرد. ئینجا خوای گەورە فەرموی ئەو شتە بەو شێوەیە نەکەن بەڵکو ئەوەی بە لای خۆتانەوە چاکە ئەوە بهێنن ئەوەتە دەفەرموێ: ﴿ناگەن بە پلەی چاکەکاری چاك هەتا لەئەوەی کە خۆتان پێتان خۆشە نەبەخشن﴾ ئالی عیمران/٩٢ . لێرەش دا دەفەرموێ: جا باش بزانن کەبە بێگومان الله بێ نیازە ﴿غَنِيٌّ﴾ لە چاکەی ئێوەو نیازی بە چاکەی ئێوە نیەو چاکەتان تەنها بەسودی خۆتانە.وە هەر خۆتان کەڵکی لێوەردەگرن. بزانە کە الله دەتوانێ هەموو خەڵك دەوڵەمەند بکات بەڵام ئەمە تاقیکردنەوەیەکەو سودەکەی هەر بۆ خۆتانە هەم لە دنیادا دەبێ بە هۆی دۆستایەتی و خۆشەویستی، هەم لە ڕۆژی قیامەتیشدا پاداشتی گەورەتان دەست دەکەوێت ئەگینا خوا سوپاس کراوە ﴿حَمِيدٌ﴾، ئەگەر مرۆڤیش سوپاسی نەکات هەزاران دروست کراوی تری الله هەیەو سوپاسی الله دەکەن و لە هەمویان زۆرتر فریشتەکانن بە ڕاستی بەخشین سوودێکی زۆر گەورەی هەیە بۆکۆمەڵگاو سارێژکەری زۆربەی برینەکانی کۆمەڵایەتین و هۆی ژیانێکی ئاسودەو بەختەوەرانەیە بۆیە شەیتان زۆر پێی ناخۆشەو هەمیشە کەم دەستی دەخاتە بەر چاوی دەوڵەمەندان و دەیان ترسێنێت لە بەخشین وەك دەفەرموێ:

(٢٦٨) ئەوە شەیتانە دەتان ترسێنێت بە هەژاری و نەداری. دەڵێت: نەبەخشن فەقیر دەبن پارەتان پێ نامێنێت و بەڵێنی فەقیریتان پێ دەدات و دەستورتان پێ دەدات بە داوێن پیسی و ئیشی خراپە کردن، بەڵام الله بەڵێنی لێخۆش بوناتان پێ دەدات هەروەها بەڵێنی قەرەبوکردنەوەی ماڵیشتان پێ دەدات و دەفەرمووێ: {ببەخشە پێت دەبەخشم}.

وە هەمو ڕۆژێك دوو فریشتە بانگ دەکەن: {فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا وَيَقُولُ الْآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا /البخاري/ جا یەکێکیان دەڵێت ئەی خوایە ئەوکەسەی کە ماڵ دەبەخشێت بۆی پڕ بکەرەوەو ئەوی تریان دەڵێ ئەی خوایە ئەوەی کەدەیگرێتەوە لەناوی ببە} بەڕاستی خوا زۆر زۆر فرەوانە لە بارەی موڵك و سامان و دەسەڵاتەوەو زۆر زانایەو هەموو ئیشەکانی لە ڕووی زانیاریەوە ئەنجام داوەو دەیدات.

(٢٦٩) کەواتە دانایی و ژیری دەدات بە کەسێك کە ئارەزۆی لێ بێت و هەر کەسێکیش کە دانایی پێ بدرێت بە ڕاستی ئەوە خێرێکی زۆری پێ دراوە. بەڵام هەر خاوەن عەقڵان بیر لەم ڕاستیانە دەکەنەوەو تەنها ئەوانن کە بتوانن ئەو ڕاستیانە بزانن. ئایەتانی پێشو بە گشتی باسی چۆنیەتی چاکە کردن بە بەرامبەر بو جا ئەو کەسە کە نەزانێت چۆن چاکە بکات یان حیکمت بەکار نەهێنێت دور نیە کە پاداشتی ئەو چاکەیە وەرنەگرێت بەڵکۆ بە شێوازێك ئەنجامی بدات کە تۆڵەیچی لێ بسێنرێتەوە کەواتە

لێرەدا حیکمەت زۆر پێویستە، لەبارەی حیکمەتەوە وتراوە "هو الإتقان عمل أو قول" واتە حیکمەت ئەو پەڕی ڕێك و پێکی و کاربەجێیە لە کردار یان لە گوفتاردا. وە ئەمەش دەست ناکەوێت مەگەر بە فێربون و تێگەیشتن لە قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ.

(٢٧٠) هەر شتێك ببەخشن کەم بێ یان زۆر یان هەر نەزرییەك بکەن خوای گەورە پێی دەزانێت و پاداشتی دەداتەوە. ئینجا هەڕەشە لە ستەم کاران دەکات و دەفەرموێ: بۆ ئەوانەی کە ستەمکارن هیچ یارمەتی دەرێکیان نیە. نەزری ئەوەیە کە تۆ دای بنێی لەسەر خۆت و بڵێی ئەگەر فلانە ئیش کرا یان فلانە شت ئاوەها دەرچوو ئەوەندە پارە یان حەیوانێك یان ئەو حەیوانە لەسەر من بێت ئەمە واجبە لە سەرت و دەبێ جێ بە جێی بکەیت مەگەر بۆ حەرام بێت یان ماڵەکە هی خۆت نەبێت چونکە نەزری نیە لە ماڵێك دا کە ماڵی خۆت نەبێت و نابێ بۆ شتی حەرام بێت بەڵام ئەگەر ماڵی خۆی بو بۆ شتی حەڵاڵ بو ئەوە دەبێ جێ بە جێی بکات وەك لەوە سفی پیاو چاکاندا الله دەفەرموێ: {ئەو نەزریەی کە لەسەریانەجێ بە جیی دەکەن﴾ لێرەشدا دەفەرموێ: هەر نەفەقەیەك بکەن و هەر ماڵێك ببەخشن بە ڕاستی خوا پێی دەزانێت. ئینجا خوا باسی چۆنیەتی بەخشینمان بۆ دەکات و دەفەرموێ:

(٢٧١) ئەگەر بە ئاشکرایی چاکە بکەن ئەمە شتێکی باشتان کردووە ئەگەر ئەوچاکەیە بە شێوەیەکی شاراوە ئەنجام بدەن و هەر فەقیرەکە خۆی بزانێت ئەو زۆر چاکترە بۆتان و خوا گوناهەکانتان لەسەر لادەبات بە هۆی ئەو چاکە کردنەوە بەو شێوە شاراوەیە چونکە هەم دڵی فەقیرەکە ناشکێ و هەم لە ڕوپامییەوە دوورە هەر لەم بارەیەوە لەم فەرمودەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە کە دەفەرموێ: {صَدَقَةُ السر تُطفِئُ غَضَبَ الرب/الط ا الصغ ، صححه الالبا / چاکەی نهێنی تووڕەیی پەروەردگار دادەمرکێنێتەوە} بەڵێ، خوا بەوەی کە ئێوە دەیکەن ئاگادارەو دەزانێت کە ئێوە چی دەکەن.

لێرەدا زانایان پێیان وایە چاکە بە ئاشکرا بکەیت یان بە مەخفیانە هەردوو باشە هەندێك دەڵێن ئەگەر چاکەکە فەرز بێت بە ئاشکرا بیکەن باشە تا خەڵك چاوتان لێ بکات، وە ئەگەر ئەوچاکەیە سونەت بو بە مەخفیانە بیکەن. ڕواڵەتی ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەگەر بە دزییەوە بکرێت باشترە.

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەفەرموێ: {لَا حَسَدَ إِلا فِي اثْنَتَيْنِ رَجُلٍ آتَاهُ اللهُ مَالًا فَسَلَّطَهُ عَلَى هَلَكَتِهِ فِي الحَق وَرَجُلٍ آتَاهُ اللهُ حِكْمَةً فَهُوَ يَقْضِي بِهَا وَيُعَلِّمُهَا/متفق عليه/ حەسادەت هەر لەدووشتدا دروستە:

وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن نَّفَقَةٍ أَوْ نَذَرْتُم مِّن نَّذْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُهُۥ ۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٢٧٠﴾ إِن تُبْدُوا۟ ٱلصَّدَقَٰتِ فَنِعِمَّا هِىَ ۖ وَإِن تُخْفُوهَا وَتُؤْتُوهَا ٱلْفُقَرَآءَ فَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ وَيُكَفِّرُ عَنكُم مِّن سَيِّـَٔاتِكُمْ ۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٢٧١﴾ ۞ لَّيْسَ عَلَيْكَ هُدَىٰهُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَهْدِى مَن يَشَآءُ ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَلِأَنفُسِكُمْ ۚ وَمَا تُنفِقُونَ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ ٱللَّهِ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ يُوَفَّ إِلَيْكُمْ وَأَنتُمْ لَا تُظْلَمُونَ ﴿٢٧٢﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلَّذِينَ أُحْصِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا يَسْتَطِيعُونَ ضَرْبًا فِى ٱلْأَرْضِ يَحْسَبُهُمُ ٱلْجَاهِلُ أَغْنِيَآءَ مِنَ ٱلتَّعَفُّفِ تَعْرِفُهُم بِسِيمَٰهُمْ لَا يَسْـَٔلُونَ ٱلنَّاسَ إِلْحَافًا ۗ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٢٧٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُم بِٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ سِرًّا وَعَلَانِيَةً فَلَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ وَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٢٧٤﴾

الف - پیاوێك خودا ماڵی پێدا بێت و زاڵی بکات بە سەریا کە لە ڕێگای ڕاست دا لە ناوی بدات.

ب - پیاوێك کە خودا دانایی پێ بدات ئەویش حوکمی پێ بکات و خەڵکیش فێر بکات}

وە لە بارەی بەخشین بەنهێنیەوە دەفەرموێ: {سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمْ اللهُ فِي ظِلِهِ يَوْمَ لَا ظِلَ إِلا ظِلُهُ الْإِمَامُ الْعَادِلُ وَشَابٌ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِهِ وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَقٌ فِي الْمَسَاجِدِ وَرَجُلَانِ تَحَابا فِي اللهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرقَا عَلَيْهِ وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ فَقَالَ إِنِي أَخَافُ اللهَ وَرَجُلٌ تَصَدقَ أَخْفَى حَتى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ/متفق عليه/ حەوت تاقم هەن کەخوا دەیانخاتە ژێر سێبەری خۆی ئەو کاتەی کە هیچ سێبەرێك نیە بێجگە لە سێبەری ئەو، یەکەم - پێشەوای داد پەروەر، دووهەم - گەنجێك کە هەر بە گەنجی لە عیبادەتی پەروەردگاریدا پەروەردە بوبێت، سێهەم - پیاوێك هەمیشە دڵی لای مزگەوت بێت کاتێ کە دەردەچێت لە مزگەوتدا ئاواتی گەڕانەوەی بێت بۆ لای، چوارەم - دوو پیاو کە لە بەر خاتری خوا یەکتریان خۆش بوێت کە یەکگرتنیان هەر لەبەر خوابێت وجیا بونەوەشیان هەر لەبەر ئەوبێت. پێنجەم - پیاوێك کە ئافرەتێکی خاوەن شکۆو جوان بانگی بکات بۆ ئیشی خراپ ئەو بڵێت من لە خوا دەترسم و شتی وا ناکەم. شەشەم - پیاوێك کە چاکەیەك بکات ئەوەندە بە نهێنی بیکات، کە دەستی چەپی نەزانێت دەستی ڕاستی چی بەخشیوە. حەوتەم - پیاوێك کە کەس دیارنەبێ یادی خوا بکات و فرمێسك

ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ ٱلرِّبَوٰاْ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِي يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مِنَ ٱلۡمَسِّۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْۗ وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْۚ فَمَن جَآءَهُۥ مَوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ فَٱنتَهَىٰ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ وَأَمۡرُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَنۡ عَادَ فَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٢٧٥) يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ وَيُرۡبِي ٱلصَّدَقَٰتِۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ كَفَّارٍ أَثِيمٍ (٢٧٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ وَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (٢٧٧) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَذَرُواْ مَا بَقِيَ مِنَ ٱلرِّبَوٰٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٢٧٨) فَإِن لَّمۡ تَفۡعَلُواْ فَأۡذَنُواْ بِحَرۡبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَإِن تُبۡتُمۡ فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ (٢٧٩) وَإِن كَانَ ذُو عُسۡرَةٖ فَنَظِرَةٌ إِلَىٰ مَيۡسَرَةٖۚ وَأَن تَصَدَّقُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ (٢٨٠) وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ (٢٨١)

بە هەردوو چاوی دا بێتە خوارەوە} عەبدوڵای کوڕی عەباس لە بارەی ئەم ئایەتەوە دەڵێ: (خوا چاکەی سونەتی شاراوەی بە هەفتا بەرامبەری چاکەی سونەتی ئاشکرا داناوەو چاکەی فەرزی ئاشکرایشی بە بیستو پێنج بەرامبەری چاکەی فەرزی شاراوە حیساب کردوە). دیسان ئەم ئایەتە چاکە کردنی بە گشتی باسکردوە واتە چاکە لەگەڵ هەر گیانلە بەرێك دا بکرێت هەر چاکەو لە لای خودا پاداشتی هەیە لە دە بەرامبەرەوە هەتا هەزارو چوارسەد بەرانبەرو زیاتر لەوەیش وەك لە پێشەوە باسمان کردوە موسڵمان بێت یان نە، مرۆڤ بێت یان حەیوان. کە ئەم ئایەتەی پاشی خۆی دەڵێن سەبارەت بەوە هات کە چاکە لەگەڵ هەمو کەسێکدا بکرێت مادام داوای بکات موسڵمان بێت یان نە دەفەرموێ:

(٢٧٢) موسڵمان کردنی ئەوان ئەرکی سەرشانی تۆ نیە و بەبێگومان هەرخوا یە کە دەتوانێت بیخاتە سەر ڕێگای ڕاست ئەو کەسەی کە خۆی ئارەزۆی لێ بێت،

ئێوە پێویستە چاکە بکەنو گوێ مەدەنە چاکە لەگەڵکراودا چونکە ئەوەی کە ئێوە دەی بەخشن بۆ خۆتانە ئیتر چیتان دەوێت لەوەی کە کابرا چیەوچۆنە خۆئێوە ئەو شتەی کە دەی بە خشن هەر لە بەر خاتری خوایە، واتە سیفەتی موسڵمانی ڕاست وایە کە هەر شتێك دەبەخشێت تەنها لە بەر ڕەزای خوا دەیبەخشێت چونکە باوەڕی هەیە کە پاداشتەکەی لەلای ﷲ دەست دەکەوێتەوە. دووبارە دەفەرموێ: ئەوەی کە ئێوە دەیبەخشن لە ماڵ پاداشتەکەیتان پێ دەدرێتەوەوئێوە ستەمتان لێ ناکرێت ئیتر کابرا هەر چۆنێك هەیە کەیفی خۆیەتیو دنیایەکی تر هەیە. بەڵێ چاکە کردن لەگەڵ هەمو کەسێك هەر باشە بە تایبەتی:

(٢٧٣) بۆ ئەو فەقیرانەی کە لە بەر خاتری خوا ڕێگایان لێ گیراوە کە ناتوانن بگەڕێن بەم زەویداو کەسابەت بکەن، جا چونکە خۆیان ناشکێننەوەو داوای شت لە خەڵك ناکەن هەر بۆیە نەزانیش لای وایە کە دەوڵەمەندن کەتۆ دەیان ناسیت بە ڕەنگو ڕوویان دا، ئینجا ڕوولەخەڵکی نانێنو خەڵك ناچارناکەن کە شتیان پێ بدەن، واتە ئەوکەسانەی کە مافی خۆیانەو شایستەن کە چاکەیان لەگەڵدا بکرێت ئەم جۆرە کەسانەنو هەر شتێکیش ببەخشن لە ماڵ چاکەو ﷲ زانەرەو پاداشتان دەداتەوە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**لَيْسَ الْمِسْكِينُ الَّذِي تَرُدُّهُ الأُكْلَةُ وَالأُكْلَتَانِ وَلَكِنْ الْمِسْكِينُ الَّذِي لَيْسَ لَهُ غِنًى وَيَسْتَحْيِي أَوْ لَا يَسْأَلُ النَّاسَ إِلْحَافًا**/متفق عليه/ فەقیر ئەوکەسە نیە کەژەمێکو دووژەم دەیگەڕێنێتەوە بەڵام فەقیر ئەوکەسەیە کە بێنیاز کەرێکی نیەولەگەڵ ئەوەشدا شەرم دەکات یان زۆر ڕوولەخەڵك نانێت بۆداوای شت کردن}.

جائەو ڕێگا لێگیراوانە کەسانێك بن کە بە بەرنامەی خواوە خەریك بنو کاریان بۆ نەکرێت یان دوژمن ڕێگایان پێ نادات کە ئیشو کار بکەنو بژێوی خۆیان دابین بکەن. واتە ڕێگرێکی مادی بێت یان مەعنەوی فەرقی نیە.

(٢٧٤) ئەوکەسانەی کە ماڵ دەبەخشن لە ڕێگای خوادا بە شەوو بە ڕۆژو بە نهێنی وبە ئاشکرا ئەوسا بۆ ئەوانە پاداشتێکی گەورە هەیە لە لای پەروەردگاریانو نە ترسێکیان لە سەرەو نە خەمیش دەخۆن لە ڕۆژی قیامەتدا. ئا بەم شێوەیە ﷲ وەسفی ئەو کەسانە دەکات کە ئاوا چاکە دەکەن. ئینجا دێتە سەر مەسئەلەی سوخۆری (ڕیبا) مادام باسی بەخشینی کرد چونکە بۆ ئەوەیە کە مرۆڤەکان یارمەتی یەکتر بدەن تا مرۆڤی هەژار پەکی نەکەوێتو ئەو کەم دەستە بە ئەندازەیەك بەرز بێتەوە نزیك بێتەوە لە دەوڵەمەندەوە دەوڵەمەندەکەش نەختێك لە ماڵی خۆی سەرف بکات تا کەمێ نزم بێتەوەو هێواش هێواش چینایەتی نەمێنێت یان کەم ببێتەوە بەڵام بە هۆی ڕیباوە چینایەتی بەپێچەوانەوە دروست دەبێت تاوەك ئەمرۆی لێ دێت کەیەکێك نانی نیەبیخوات یەکێکی تریش پێشبڕکەی ملیارد لەری دەکات یەکێك جێگای چادرێکی نیە هەڵیداتو ئەوی تر بەسەدان دۆنم لە سەرخۆی تاپۆ دەکاتو...و...هتد ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٢٧٥) جا ئەوانەی کە ریبا دەخۆن رۆژی قیامەت کە زیندو دەکرێنەوە وەك کەسانێکن کە شەیتان دەستی لێوەشاندونو شێت بوون ئاوەها هەڵدەستنەوەو بێهۆشنو ورێنە دەکەن چونکە بەبێگومان ئەوانە لە دنیادا گاڵتەیان بە ئایین دەکردو دەیان وت: مامەڵەش هەروەك ریبایە لەحاڵێکدا ﷲ مامەڵەی حەلاڵ کردووەو ریبای حەرام کردوە، جا ئەو کەسەی کە ئامۆژگاری بۆ هات لەلای خوای خۆیەوەو لەم بارەوە تێگەیشت کە ریبا حەرامەو ئەویش دەسبەجێ وازیان لێ هێنا ئەوسا ئەوکەسە بۆی هەیە ئەوەی لە پێشەوە وەری گرتوە، واتە داوای گەڕانەوەی سودە پێشەوەکانی لێ ناکرێتو سەرنویشتی ئەو کەسە لە لای خوایە کە لە پاشە رۆژدا چی حیسابێکی لەگەڵدا دەکات، وەهەر کەسێکیش کە گەڕایەوە سەر ئەم مامەڵەیە دوای ئەوەی کە زانی حەرامە ئەوسا ئەوانە یارو دۆستی دەستەملی ئاگری دۆزەخن کە ئەوان بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە. ئەمەش هەڕەشەیەکی زۆر پڕ مەترسیە بۆ ئەو کەسانە کە سوو دەخۆن چونکە مانەوەی هەمیشەیی ناو ئاگری جەهەنەم تەنها بۆ کافرانە، ئەم سوو خۆرانەیش بەم ئیشەیان کافر دەبن ئەگەر بە حەلاڵی بزانن و گاڵتە بە یاسای ئیسلام بکەن، ئەگەر بە حەرامیشی بزانن جا توشی یەکێکە لەو حەوت گوناهە گەورانە بوون کە پێغەمبەری خوا بە لەبەینبەرو پشت شکێن ناویان دەبات، وەك جابر دەڵێت: {لَعَنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ آكِلَ الرِّبَا وَمُؤْكِلَهُ وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ وَقَالَ هُمْ سَوَاءٌ/ مسلم وغ ه/ پێغەمبەری خوا ﷺ نەفرینی لە سوخۆرو سودەرو نوسەرو شایەتەکانی کردووەو دەفەرموێت: هەموویان وەك یەکن لە تاواندا}.

پەیوەندی نێوان ئەم ئایەتەی ریبا بە پێشەوە پەیوەندییەکی دژایەتیە یەکەمیان خوێنی خۆی دەدات بۆژیانی خەڵك دووهەمیان خوێنی خەڵك دەخوات بۆ ژیانی خۆی، یەکەمیانماڵی بۆ رەزامەندی ﷲ یەو هۆیەکە بۆ رژانی نیعمەتەکانی پەروەردگار دووهەمیان بەماڵی دژایەتی ﷲ دەکاتو سزاو تورەیی پەروەردگار دەهێنێت، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { مَا ظَهَرَ فِي قَوْمٍ الرِّبَا وَالزِّنَا إِلا أَحَلُّوا بِأَنْفُسِهِمْ عِقَابَ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ/ أ ، د، حسنه الألبا / لە ناو هەر گەلێکدا ریباو زینا ئاشکرا بوبێت سزای ﷲ یان بە سەرخۆیاندا هێناوە } ریباو زینا دوو تاوانی گەورەن کە دەبن بە هۆی هاتنی عەزابی پەروەردگار بەڵام پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {دِرْهَمٌ رِبًا يَأْكُلُهُ الرَّجُلُ وَهُوَ يَعْلَمُ أَشَدُّ مِنْ سِتَّةٍ وَثَلَاثِينَ زَنْيَةً/ أ ، د، صححه الألبا / درهەمێك ریبا کە پیاو دەیخوات لەحاڵێکدا کە دەزانێت ئەوە ریبایە تاوانی لە سی‌و شەش زینا سەختترە}.

یەکەمیان خواپەرستە، دووهەمیان پارەپەرستە، پێغەمبەرمان دوعا لە پارەپەرست دەکاتو دەفەرموێ:{ تَعِسَ عَبْدُ الدِّينَارِ وَالدِّرْهَمِ/ متفق عليه/ لەبەینچێت بەندەی دینارو دیرهەم}، یەکەمیان خۆشەویستی خودایە، دووهەمیان دژمنی خودایە، یەکەمیان بەم ژیانەی ئەو ژیانەکەی تری خۆش دەکات، دووهەمیان بەم ژیانەی ئەوژیانەکەی تری خراپ دەکات، یەکەمیان بەهەشت جێگایەتی، دووهەمیان دۆزەخ جێگایەتی، ئەمانەو دەیان جیاوازی تریان هەیە. یان دەتوانین بڵێن ئەم دووئایەتە هەردوو سەبارەت بە ماڵن کەیەکەمیان لەناوی دەبات بۆ سودی خەڵكو دووهەمیان کۆی دەکاتەوە بەزیانی خەڵك. یان هەردوو سەبارەت بەفەرمانەکانی خودان کەیەکەمیان دەبێت ئەنجام بدرێتو دووهەمیان دەبێ وازی لێ بهێنرێت.

جا ئەوانەی کە پێیان وایە شتێك لە ئابوری دەزانن‌و سەریان سورِ دەمێنێت لە حەرام بونی ریبا دەڵێن: مامەڵەش هەروەك ریبا وایە کەواتە دەبێ مامەڵەش نەکەین چونکە ئەویش هەر قازانجی هەیەو هەروەك یەك وان ئەگەر مامەڵە حەلاڵ بێت سوو خواردنیش حەلاڵە ئا بەو شێوە ناشیرنە لەگەڵ ئایین‌و پێغەمبەری خوادا ﷺ قسەیان دەکرد بۆیە کاتی زیندو بونەوەیان وەکو شێت وان بەڵکو لەشێتیش وەزعیان پیسترو خراپتر دەبێت بە راستی ئەم قسەیان قسەی شێتانە چونکە مامەڵەو سوو هەرگیز وەکو یەك نین مامەڵە سودی هەیە بەڵام هەمیشە نیەو هەندێ جاریش زیان دەکات بە پێچەوانەوە سوو هەرگیز زیان ناکات هەمیشە هەر سود دەبات، جا ئەگەر وا چاوەڕێ بکەن کە بە هۆی ئەو سوو خواردنەوە دەوڵەمەند دەبن ﷲ دەفەرموێ:

(٢٧٦) ئەو ماڵە زیادەی کە سوو خۆر دەستی دەکەوێت خوا لە ناوی دەباتو بێ سوودی دەکات بۆی بەڵام خوا چاکەکانو ماڵ بەخشینەکان گەورەو زیاد دەکات، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: ﴿مَنْ تَصَدَّقَ بِعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ وَلَا يَقْبَلُ اللهُ إِلَّا الطَّيِّبَ وَإِنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُهَا بِيَمِينِهِ ثُمَّ يُرَبِّيهَا لِصَاحِبِهِ كَمَا يُرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ/متفق عليه/ واتە هەر کەسێك بە ئەندازەی خورمایەك چاکە بکات لە ماڵێکی پاك کە خودا ماڵی پاك نەبێت وەری ناگرێت ئەوە بە راستی خودا بە دەستی راستی خۆی وەری دەگرێتو لە پاشدا گەورەی دەکات بۆ خاوەنەکەی چۆن ئێوەی جوانوی ماینەکەتان گەورە دەکەن تا ئەو چاکەیە دەبێت بە ئەندازەی چیایەك، بەڵام سووخۆری هەرچەند زۆر بێت ئاکامەکەی بەرەو زیانو کەمی دەچێت وەك لەم فەرمودەیەدا هاتوە کە پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی: {الرِّبَا وَإِنْ كَثُرَ فَإِنَّ عَاقِبَتَهُ تَصِيرُ إِلَى قُلٍّ / أ ، د، صححه الالبا / واتە سوو هەرچەند زۆر ببێت ئاکامەکەی بەرەو کەمی دەچێت}.

روخانو شکستی ئابوری جیهانی لەم سەردەمەدا کە بەدان پێدانانی زانایانی ئابوری ناس سەرچاوەکەی ریبای بانقەکان بوە بەزەقی مانای ئەم فەرمودەی پیشاندایین جا بەسەربەزیەوە دەڵێین: رَضِينَا بِاللهِ رباً و بمحمدٍ رسولاً وبالإسلامِ ديناً " جا شەمشەمە کوێرەکان با هەر رۆژ نەبینن." بەڵێ ئەم دوو فەرموودەیە مانای ﴿ يَمۡحَقُ ٱللَّهُ ٱلرِّبَوٰاْ ﴾ ی بۆ کردین، بەراستی خوای گەورە هیچ کافرو گوناهبارێکی خۆش ناوێت کابرای سوو خۆر بەوبەشەی ﷻ رازی نیەو کەسابەتی حەڵاڵی پێ کەمەو دەیەوێت بە مژینی خوێنی خەڵك خۆی سەروەت مەند بکات واتە ئینکاری نیعمەتی خودا دەکاتو تاوانبارە بە هۆی ئەو ماڵی خەڵك خواردنە بەو رێگا حەرامە. ئینجا ﷻ سەبارەت بە پیاو چاکان دەفەرموێ:

(٢٧٧) بێگومان ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هەیەو کرداری چاك دەکەنو نوێژەکانیان دەکەن زەکات دەدەن بۆ ئەوان هەیە پاداشتی گەورە لە لایەن خودای خۆیانەوەو ترسیان نیەو خەمیش ناخۆن لە رۆژی قیامەتدا. ئینجا دەچێتەوە سەر باسی سوو دەفەرموێ:

(٢٧٨) ئەی باوەڕداران لە خوا بترسنو واز بێنن لە ریباو واز بێنن لەوەی کە ماوەتەوە لە ریباو زیادەی پارەکەی خۆتان وەرنەگرن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

(٢٧٩) ئەوسا ئەگەر وا نەکەن سا ئیتر با جاڕی شەڕ بدەن دژی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ . جا لەسەر ئەمە قسەیەکی ئیمامی مالك هەیە دەڵێن، جارێکیان کابرایەك لە شەوێکی مانگە شەودا کابرایەکی عارەق خۆری دی کە بە شوێنی مانگ دا ڕای دەکرد، دەی وت: مانگ دەگرم، جا تەلاقی خوارد کە هیچ شتێك لەوە پیستر نیە ئینجا بەیانی هاتە لای ئیمامی مالكو پرسیاری لێ کرد کە من تەلاقێکی واو خواردوە ئایا هیچی تر هەیە پیستر لە عارەق؟ فەرموی بچۆرەوە بەیانی وەڵامت دەدەمەوە. دەڵێ: کە بەیانی گەڕایەوە وتی: بەڵێ تەلاقت کەوتوە چونکە ریبا لە عارەق پیسترە، ﷻ بۆ هیچ شتێك شەڕی رانەگەیاندوە مەگەر دژی سوو خۆر.

بەڵێ سوخۆری ئەوەندە پیسە بەڵام خودا زۆر بە رەحمەو دەفەرموێ: ئەگەر تەوبە بکەن ئەوە بۆتان هەیە کە سەرمایەکەتان وەرگرنەوە لە کابرا نە زوڵم بکەن لە کابراو زیادەی لێ وەرگرنو نە زوڵمیشتان لێ بکرێت کە مافی خۆتانتان پێ نەدرێتەوە. ئینجا دەفەرموێ:

(٢٨٠) ئەگەر قەرزارەکە نەدار بو دەسەڵاتی بژاردنەوەی نە بو دەی مۆڵەتی بدەن تا ئەو کاتەی کە دەسەڵات پەیدا دەکات.جا لەم بارەیەوە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ هەیە کە دەفەرموێ: {عَنْ أَبِي قَتَادَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ مَنْ نَفسَ عَنْ غَرِيمِهِ أَوْ مَحَا عَنْهُ كَانَ فِي ظِلِّ الْعَرْشِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ/ا دوء ه. صححه الالبا / لە ئەبو قەتادەوە هاتوە کەوتویەتی بیستم لەپێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەیفەرمو: هەرکەسێك کەماوە بەقەرزارێ بدات یان لەسەری لابات ئەوە لەرۆژی قیامەتدا لەژێرسێبەری عەرشدایە}

لێرەش خودا دەفەرموێ: ئەگەر چاکە بکەنو کابرای کەم دەست عەفو بکەنو هیچی لێ وەرنەگرنەوە ئەوە چاکە بۆتان ئەگەر ئێوە بەخۆتان بزانن چونکە ئەوە ماڵێکی نەفەوتاوەو رۆژی قیامەت دەستتان دەکەوێتەوە. وەك دەفەرموێ: ﴿ئەوەی کەڵای خۆتانە لە ناو دەچێت بەڵام ئەوەی کەڵەڵای خوایە دەمێنێتەوە﴾نەحل/٩٦. ئێمە لە بارەی تاوانی سوو خۆرییەوە باسێکمان لە پەڕاوی ئابوری لە ئیسلامدا نووسیوە جا بۆ کەسێك کە زیاتری دەوێت با چاوێك بەودا بخشێنێتەوە. ئینجا خوای گەورە ئامۆژگاری بەندەکانی دەکاتو وەبیریان دەخاتەوە کە دنیاو ئەوەی کە تێیدایە هەموی لە ناو دەچێتو هەمو دەگەڕێنەوە بەردەم داداگای دادپەروەری خواو دەفەرموێ:

(٢٨١) بترسن لە رۆژێك کە ئێوە دەگەڕێنەوە بۆ لای دادگای خواو هیچ کەستان لەگەڵدا نایەت بێجگە لە کردەوەکانتان پاشان هەمو نەفسێك ئەوەی کە کردویەتی پێی دەدرێتەوەو ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت ئەگەر خراپەی کردوە خراپە پاداشیەتیو ئەگەر چاکەشی کردوە، چاکە پاداشتیەتی.

دەڵێن ئەم چەند ئایەتە ئاخرین ئایەتن کە هاتونەتە خوارەوەو پێغەمبەرمان ﷺ نۆ رۆژ پاش ئەم ئایەتانە ژیاوە. ئینجا لە درێژ ترین ئایەتی قورئاندا خوای گەورە سەبارەت بە قەرز دانو کرینو فرۆشتن کە گرنگترین بەشەکانی ئابوریە باسمان بۆ دەکات کە بە ئایەتی پاش خۆی دەتوانین بڵێن تەواوی بنەما سەرەکیەکانی ئابوری لە خۆ گرتوە جا دەفەرموێ:

(٢٨٢) ئەی خاوەن باوەڕان ئەگەر ئێوە قەرزتان دا بە یەکتر بۆ ماوەیەکی ناوبراو ئەوسا بینوسن تا لە بیر نەچێتەوەو لەپاشدا

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُۚ وَلۡيَكۡتُب بَّيۡنَكُمۡ كَاتِبُۢ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَلَا يَأۡبَ كَاتِبٌ أَن يَكۡتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ ٱللَّهُۚ فَلۡيَكۡتُبۡ وَلۡيُمۡلِلِ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ وَلۡيَتَّقِ ٱللَّهَ رَبَّهُۥ وَلَا يَبۡخَسۡ مِنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ فَإِن كَانَ ٱلَّذِي عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِۚ وَٱسۡتَشۡهِدُواْ شَهِيدَيۡنِ مِن رِّجَالِكُمۡۖ فَإِن لَّمۡ يَكُونَا رَجُلَيۡنِ فَرَجُلٞ وَٱمۡرَأَتَانِ مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ أَن تَضِلَّ إِحۡدَىٰهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحۡدَىٰهُمَا ٱلۡأُخۡرَىٰۚ وَلَا يَأۡبَ ٱلشُّهَدَآءُ إِذَا مَا دُعُواْۚ وَلَا تَسۡـَٔمُوٓاْ أَن تَكۡتُبُوهُ صَغِيرًا أَوۡ كَبِيرًا إِلَىٰٓ أَجَلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ أَقۡسَطُ عِندَ ٱللَّهِ وَأَقۡوَمُ لِلشَّهَٰدَةِ وَأَدۡنَىٰٓ أَلَّا تَرۡتَابُوٓاْۖ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً حَاضِرَةٗ تُدِيرُونَهَا بَيۡنَكُمۡ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَلَّا تَكۡتُبُوهَاۗ وَأَشۡهِدُوٓاْ إِذَا تَبَايَعۡتُمۡۚ وَلَا يُضَآرَّ كَاتِبٞ وَلَا شَهِيدٞۚ وَإِن تَفۡعَلُواْ فَإِنَّهُۥ فُسُوقُۢ بِكُمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ وَيُعَلِّمُكُمُ ٱللَّهُۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٢٨٢﴾

توشی کێشە نەبن، با لە نێوانتان دا نوسەرێك دادپەروەرانە بینوسێتو نوسەر نەڵێت نای نوسم، هەروەك ﷲ چۆن فەرمانی بەسەر داداوەو ئەوی فێری عیلم کردوە ئاوەها ئەویش یارمەتی کابرا بداتو بۆی بنوسێت جا نوسەر با بنوسێ بەو شێوەیەی کەقەرز وەرگر دەڵێتو با لە خوا بترسێت کابرای قەرز وەرگرو هیچی لێ کەم نەکاتەوە نە لە مەوعیدەکەو نە لەماڵەکە جا ئەگەر کابرای قەرزار خۆی نەزان بو یان بێ هێزو لاواز بو نەی دەزانی چۆن قسە بکاتو چی بڵێت تا نوسەر بۆی بنوسێت ئەوسا با سەرپەرشتی قەرازارەکە بڵێت، هەندێك دەڵێن وەلیەکە بریتیە لە ساحیب قەرزەکە. واتە با خاوەن قەرزەکە بڵێت بە نوسەرو دوو شایەتیش لەو کاتەدا بە شایەت بگرن لە پیاوانتان جا ئەگەر دوو پیاو نەبوون با پیاوێكو دوو ژن بن واتە پیاوێك لە باتی دوو ژن حیساب دەکرێت ئەم دوو ژنە مانای وا نیە کە هەردووکیان شایەت دەبن لە دادگادا بەڵکو لە بەر ئەوەیە کەئەگەردوان بن یەکێکیان شتێکی لە بیر بچێتەوە ئەوی تریان وە بیری دەهێنێتەوە چونکە ژنان وا دروست بوون لە بیر چونەوەیان زۆرترە بەڵام کاتی مەحکەمە تەنها یەکێکیان داوا دەکرێت، ئەگەر شتێکی نەزانیو بە بیری نەهاتەوە ئینجا ئەوی تریان بانگ دەکرێت بزانرێت چۆن بوەو بۆیان راست کاتەوە وەکو دەفەرموێ: لەوکەسانەی کە ئێوە بە لاتانەوە پیاوی چاکن جا ئەگەر یەکێك لەو دوو ئافرەتانە لە بیری چوویە جا ئەوی تریان دەی خاتەوە بیری، جا هەروەکو فەرموی نوسەر نابێ نەینوسێت هەروەها شایەتیش هەر کاتێ بانگ کران بۆ شایەتی ئەویش نابێ خۆی ببوێرێتو شایەتی نەدات، بێ تاقەتوبێ حەوسەڵە مەبن لە نوسینی ئەوقەرزە کەم بێت یان زۆر بێت پێویستە بینوسن، نەڵێن ئەوە شتێکی کەمەو لە بیر ناچێت. بەم شێوەیە پەروەردگارمان ئامۆژگاریمان دەکات تا شەڕو قەپو قاڵ لە نێوانماندا روونەدات بۆیە فەرموی: با نوسەر بنوسێتو شایەت شایەتی بداتو لەم نوسینو شایەتیەدا کۆتایی نەکەن، هەتا دەگاتە ماوەی خۆیو ئیشەکە دوایی دێت ئەوە ئیشێکی دادپەروەرانەو راست ترە لای خواو زۆر بە هێزترە بۆ شایەتی دان لە پاشداو قسەی شایەتەکان بە هێزتر دەکاتو نزیکترە بۆ ئەوەی لە پاشدا نەکەونە گومانەوە مەگەر ئەو کاتەی کە بازرگانیەکی ئامادەو دەست بە دەستی بێت کە ئەو شتانە زۆر زوو بکڕنو بفرۆشنەوە، ئەم نوسینە لێرەدا سەختە، بۆیە دەفەرموێ: لەم حاڵەتدا ئەگەر نەینوسن گوناهتان ناگات بەڵام هەر کاتێ مامەڵەتان کردو شتتان فرۆشت با شایەتتان هەبێت تا لە دواییدا دوچاری کیشە نەبن بەڵام ئەمە پێویست نەکراوە بەڵکو بۆ رێنمایی کردنە، وەك لەئەم فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ دا هاتوە کە دەفەرموێ: {إنا أمةٌ أميةٌ لَا نَكْتُبُ وَلَا نَحْسُبُ /متفق عليه/ ئێمە گەلێکی نەخوێندەوارین نەدەنوسینو نەژمارە دەکەین} هەروەها لەفەرمودەیەکی تردا هاتوەکە{ إن رَجُلًا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يُسَلفَهُ أَلْفَ دِينَار قَالَ : أْتِيتنِي بِالشهَدَاءِ أُشْهِدُهُمْ، قَالَ: كَفَى بِاللهِ شَهِيدًا قَالَ: أْتِيتنِي بِالْكَفِيلِ، قَالَ:كَفَى بِاللهِ كَفِيلًا. قَالَ: صَدَقْت فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمى. فَخَرَجَ فِي الْبَحْرِ فَقَضَى حَاجَتَهُ وَالْتَمَسَ مَرْكَبًا يَرْكَبُهُ لِئَلا يَقْدَمَ عَلَيْهِ الْأَجَلُ الذِي أَجلَهُ فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَبًا فَأَخَذَ خَشَبَةً فَنقَرَهَا وَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَار وَصَحِيفَةً مِنْهُ إِلَى صَاحِبِهِ، ثُم زَججَ مَوْضِعَهَا ثُم جَاءَ بِهَا إِلَى الْبَحْرِ، فَقَالَ: اللهُم إِنك تَعْلَمُ أني تَسَلفْت مِنْ فُلَانٍ أَلْفَ دِينَار، فَسَأَلَنِي كَفِيلًا فَقُلْت لَهُ: كَفَى بِاللهِ كَفِيلًا فَسَأَلَنِي شَهِيدًا فَقُلْت لَهُ: كَفَى بِاللهِ شَهِيدًا فَرَضِيَ بِذَلِكَ، وَإِني جَهَدْت أَنْ أَجِدَ مَرْكَبًا أَبْعَثُ إِلَيْهِ بِالذِي لَهُ فَلَمْ أَقْدِرْ وَإِني قَدْ اسْتَوْدَعْتُكَهَا وَرَمَى بِهَا فِي الْبَحْرِ حَتى وَلَجَتْ فِيهِ ثُم انْصَرَفَ وَهُوَ فِي ذَلِكَ يَلْتَمِسُ مَرْكَبًا يَخْرُجُ إِلَى بَلَدِهِ فَخَرَجَ الرجُلُ الذِي كَانَ أَسْلَفَهُ يَنْظُرُ لَعَل مَرْكَبًا قَدْ جَاءَ بِمَالِهِ فَإِذَا بِالْخَشَبَةِ التِي فِيهَا الْمَالُ، فَأَخَذَهَا لِأَهْلِهِ حَطَبًا، فَلَما نَشَرَهَا وَجَدَ الْمَالَ وَالصحِيفَةَ، ثُم قَدِمَ الذِي كَانَ أَسْلَفَهُ وَأَتَى بِالْأَلْفِ دِينَار وَقَالَ: وَاللهِ مَا زِلْت أَجْهَدُ فِي طَلَبِ مَرْكَبٍ لِآتِيَك بِمَالِك، فَمَا وَجَدْت مَرْكَبًا قَبْلَ الذِي أَتَيْت فِيهِ قَالَ: هَلْ كُنْت بَعَثْت إِلَي بِشَيْءٍ؟ قَالَ: نَعَمْ وَأَخْبَرْتُك أني لَمْ أَجِدْ مَرْكَبًا قَبْلَ الذِي جِئْتُك فِيهِ قَالَ: بَلَى وَاللهِ، قَدْ أَدى اللهُ عَنْك الذِي بَعَثْت بِهِ فَانْصَرَفَ بِالْأَلْفِ دِينَار رَاشِدًا /جامع الصغ .صحح الالبا / کابرایەکی بەنی ئیسرائیلی داوای قەرزی کرد لە نەفەرێك، وتی: چەندشایەتێك بێنە وتی: ﴿وكفى با شهيداً﴾ خوا بەسە شایەتمان بێت وتی: کەفیلم بۆ بێنە وتی:﴿وكفى با وكيلاً﴾ خوا بەسە کە کەفیل بێت وتی: راستدەکەیتو هەزار دیناری دا بەو کابرایەبۆکاتی دیاریو پاشان لە یەك جیا بوونەوەو کابرا بەرەو دەریا چوو ئیشەکەی خۆی ئەنجام دا جادوای ماوەیەك کە کاتی دانەوەی

۞ وَإِن كُنتُمْ عَلَىٰ سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَّقْبُوضَةٌ ۖ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُم بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِي اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ ۗ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ ۚ وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ ۗ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨٣﴾ لِّلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ وَإِن تُبْدُوا مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللَّهُ ۖ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ ۗ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٨٤﴾ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ ۚ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ۖ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا ۚ أَنتَ مَوْلَانَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٨٦﴾

هاتو کابرای قەرزدار هەرچەند گەڕا وڵاخێکی دەست نەکەوت کە بڕوات قەرزەکەی بۆ خاوەنەکەی بباتەوە. وتی: خوایە تۆ خۆت ئاگاداری ئەم کابرایە داوای شایەتی لە من کرد تۆم کرد بە شایەتو داوای کەفیلی لێکردم تۆم کرد بە کەفیل. لە دوایدا کابرا دارێکی هێناوکونی کردو هەزار دینارەکەونامەیەك لەخۆیەوە بۆکابرای خاوەن قەرزەکە نوسیو خستیە ناوییەوە ئینجا کونی دارەکەی محکەم گرتوبردی بۆلای ئەوروبارەی کەبەرەولای خاوەن قەرزەکە دەچو ، جا وتی: خوایە تۆ خۆت دەزانی کەمن داوای هەزار دینار قەرزم لەفلان کردو داوای کەفیلی لێم کرد پێم وت: بەسە کە خوا کەفیل بێو داوای شایەتی لێ کردم پێم وت: بەسە کە خوا شایەت بێ جا ئەویش ڕازی بو، وەمن زۆرم هەوڵدا وڵاخێکم دەست نەکەوت کە سواری ببمو ئەم قەرزەی بۆببەمەوە ئاوا من بەئەمانەت دەیدەمەوە بەتۆ و دارەکەی بەرەو ڕووبارەکە پاڵنا تاچوەناوییەوە، پاشان گەڕایەوە بەڵام هەر هەوڵی ئەوەی دەدا کەوڵاخێکی سواری دەست کەوێتوبچێت بۆ ئەوشارەی خاوەن قەرزەکە، جا ئەو کابرایەش کە قەرزی لە لای بو هەر چاوەڕێی دەکرد لەسەر ئەو ڕووبارە بەڵکو کەسێك بێتو قەرزەکەی بۆ بێنێتەوە جا بینی کۆڵکە دارێك لەسەر ئاوەکە دێت ئەویش گرتیەوەو بردیەوە بۆماڵەوە کە بیسوتێنێت کە لەتی کرد بۆ سوتان دیتی کاغەزێکی تێدایە کاغەزەکە لێ کردەوەو تەماشای کرد کە هەزار دینارەکەی لە ناو کاغەزەکەدایە بەم شێوەیە کابرا هەزار دینارەکەی بە دەست گەیشتەوە کابرای تریش هەر خەمی دەخوارد دەیووت ئایا هەزاردینارەکەی بەدەست نەگەیشت بێت پاش ماوەیەکی کەم کابرای قەرزدار وڵاخێکی دەست کەوتو هەزار دیناری تری لەگەل خۆی بردو چوبۆ لای کابراو وتی: خودا ئاگادارە ویستم لەکاتی خۆیدا پارەت بۆ بهێنمەوەبەڵام هیچ وڵاخێکم بەدەست نەکەوت تابێم بۆلاتان. خاوەن قەرزەکەش وتی: ئەی لە پێشەوە کەسێکت ڕەوانە نەکردوە؟وتی: پێم وتیت بەخوا وڵاخێکم دەست نەکەوت پێش ئیستا، ئینجاخاوەن قەرز وتی: نەوانیە بەخوا، خوا ئەوەی کە ناردوتەوە بە دارەکەوە بە دەستمی گەیاند، جا کابرا بە هەزار دینارەکەوە بە خۆشی بەرەوماڵ گەڕایەوە} جا ئاوایە هەر کەسێك بە ڕاستی خوا بکات بە شایەتو بە کەفیل. ئەم ڕیوایەتە ئیمامی بوخاری لە حەوت شوێندا نەقڵی کردوە ئەمانە ئەوە دەگەیەنن کە شایەتو نوسین واجب نیە بەڵام لەم بارەوە کە لە کەعبەوە دەیگێڕنەوە کە کابرایەك دوعای کرد لە کابرایەك کە قەرزی لا بو خوای گەورەش دوعاکەی لێ قەبوڵ نەکرد. چونکە ئەو کاتە خۆی بە گوێی خوای نەکرد بو نە شایەتی هەبو نە نوسەر. بۆیە دەفەرموێ: نە نوسەرکەو نە شایەتەکان زیانیان لێ نەدرێت، وەئەگەر شتی واتان کردوزیانتان لێدان ئەوسا ئەوە گوناهێکی گەورەیەو پێی تاوانباردەبن و بترسن لە اللَّه خۆ اللَّه ئێوە شارەزا دەکات کە چۆن لەگەل یەکتردا هەڵسوکەوتی جوانو مرۆڤ دۆستانە ئەنجام بدەنو اللَّه زانایی بە سەر هەمو شتێك دا هەیە.

﴿٢٨٣﴾ جا ئەگەر ئێوە لە سەفەردا بونو کەسێك نەبو بنوسێت بۆتانو نیازتان بو، کە قەرز وەربگرن لە کابرایەك یان قەرز بدەن بە کابرایەك بائەوکارەبکەن جا بارمتەیەك(الرهن) وەرگیرێت. بۆ نمونە تۆ دەتەوێت دە دینار لە کەسێك وەرگریو ئەویش دەتوانێت لە باتی ئەو دە دینارە شتێك لە بارمتەی دا وەرگرێت، بەڵام نابێت سود لەو شتە وەربگرێت چونکە تەنها لە باتی قەرزەکەیەو ئەگەر قەرزەکەت لە کاتی دیاری خۆیدا پێنەدایەوە بۆی هەیە شتەکەت بفرۆشێتو پارەی خۆی لێ هەڵبگرێتو هەرچی زیادی بو دەبێ بیداتەوە پێت ئەمە پێی دەوترێت ڕەهن، ئەوەی کە ئەمڕۆ دەکرێتو کابرای خاوەن قەرز سود لە ڕەهنکراوەکە وەردەگرێت تا کابرا قەرزەکەی دەداتەوە دروست نیەو بەشێکە لە سو خۆری، وتراوە (كُلُّ قَرْضٍ جَرَّ نَفْعًا فَهُوَ رِبًا، هەر قەرزێك زیادەی بێتەسەر ئەوە ڕبایە) ئەو ڕەهنە تەنها بۆ ئەوەیە کە کابرای خاوەن قەرز دڵنیابێت کە ماڵەکەی نافەوتێت. ئینجا خوای گەورەو کاربەجێ یاسایەکی ترمان هەر لە بارەی مامەڵەوە بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ: جا ئەگەر هەندێك لە ئێوە هەندێکی تری کرد بە ئەمینو شتێکی دایە دەستیو وتی: با ئەمە لای تۆ بێت جا هەر کاتێك داوا لەکابرای ئەمین کرا با ئەمانەتەکە بداتەوەو ماتەڵی نەکات. واتە ئەمانەت دانان دروستەو کابرای ئەمینیش نابێ دەستی لێ بدات. چونکەیەکێك لە بەڵگەی مونافیق ئەوەیە کە خیانەت لە ئەمانەت بکات. جادەفەرموێ: وە با لەو خوایە بترسێت کە پەروەردگاریەتی، وە شایەتی نەشارنەوەو نەترسن لە کەس بۆ ئەو شایەتی دانەش،

ئەوسا هەر کەسێك ئەو شایەتیە بشارێتەوە خۆی گوناهبار کردووە خۆی دوچاری سزا دەبێت لە پاشە رۆژداو ﷻ بەوەی کە ئێوە دەیکەن زانایە.

(٢٨٤) موڵکی خوایە ئەوەی کە لە ناو ئاسمانەکاندایەو ئەوەیش کە لە ناو زەویدایە، وەئەوەی کە لە ناو دڵتان دایە چ دەری بخەن‌و چ بیشارنەوە ﷻ پرسیارتان لێ دەکات ئەوسا خۆش دەبێت لەو کەسانەی کە ئارەزۆی لێ بێت‌و سزا دەدات ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت‌و کەس ناتوانێت زۆری لێ بکات نە بۆ بەخشین‌و نە بۆ سزا چونکەبەراستی ﷻ توانای بە سەر هەمو شتێکدا هەیەو هیچ شتێك توانای بەسەر ئەودانیە. ئەبو هورەیرە دەڵێت: کاتێ کە ئەم ئایەتەی سورەتی بەقەرە دابەزی یارەکانی پێغەمبەرﷺ زۆر خەمبار بون‌و زۆر ترساون‌و چونەتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ‌و لەسەر ئەژنۆ دانیشتون جا وتویانە: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوەی تا ئێستاداوامان لێ کراوە لەکردار لەتوانامانذا بووە کردومانە، نوێژ، رۆژوو، غەزاو چاکە، بەراستی ئەم ئایەتە دابەزیوەتە لاتو لەتوانامانذا نیە، فەرموی: {أَتُرِيدُونَ أَنْ تَقُولُوا كَمَا قَالَ أَهْلُ الْكِتَابَيْنِ مِنْ قَبْلِكُمْ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا بَلْ قُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ}؟ /ا دومسلم/ پێغەمبەرﷺ فەرموێ: ئایا وا دەڵێن: کە ئەهلی هەردوو کتێبەکەی پێش ئێوە وتیان بیستمان‌و سەرپێچیمان کرد؟

بەڵکو بڵێن: بیستمان‌و پەیڕەویمان کردو چاوپۆشیتمان دەوێت ئەی پەروەردگارمان وهەر بۆلای تۆیە سەرەنجامەمان؟ جا ئەوانیش وتیان: بیستمان‌و پەیڕەویمان کردو چاوپۆشیتمان دەوێت ئەی پەروەردگارمان وهەر بۆلای تۆیە سەرەنجامەمان جا کاتێ ئەو گەلە ئەوەیان خوێندەوە، زمانیان بەو رام بو ئینجا بەدوای ئەوەدا ﷻ ئەم ئایەتانەی رەوانە کرد ﴿ ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ .. ﴾ جا کاتێ ئەمەیان کرد خوای بڵەند مەقام ئەو بۆچونەی ئەوانی لەو ئایەتە هەڵوەشاندەوە، ئینجا ئایەتی ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۚ ... ﴾ ی، دابەزاند}

(٢٨٥) پێغەمبەر ﷺ باوەڕی هەیە بەوەی کە دابەزیوەتە لای لە لایەن پەروەردگاریەوەو باوەڕدارانیش هەمویان باوەڕیان هەیە بە خواوو بە فریشتەکانی‌و بە پێغەمبەرەکانی‌و دەڵێن: جیاوازی ناخەینە نێوان هیچ کام لە پێغەمبەرانیەوەو هەمویان پێغەمبەری خوا بوون هەمویشیان راست بوون‌و هەمویان پەیامی خۆیان بەتەواوی ئەنجام داوە، جاوتیان: بیستمان‌و گوێ رایەڵیمان کرد لێ خۆشبوونمان لێت دەوێ ئەی پەروەردگارمان‌و هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوە. واتە، پاداشت‌و سزامان هەر لە لای خۆتەو چاوەڕوانی بەخشین‌و بەهەشتی هەتا هەتاین. ئینجا پاش ئەوە کە موسڵمانان وتیان: ﴿ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا ﴾ ﷻ بەزەی بە موسڵمانان دا هاتەوەو فەرموی: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَا ... ﴾

ﷻ تەکلیف ناکات لە هیچ کەسێك مەگەر بە گوێرەی توانای خۆی بێت. بەو شێوەیە خەتەراتی ناو دڵ کەوت بەر عەفوی خواوچاو پۆشی لێ کراو باری گرانی پێشوو لا برا جا ئەگەر کەسێك خەتەرەیەکی خراپی بە ناو دڵدا هات بەڵام دەوامی لەسەر نەکرد ئەوە عەفوو کراوە، هەر کەس هەر ئیشێکی باشی کردبێت بۆخۆیەتی‌و پاداشتی وەردەگرێتەوە ئەگەر خۆی هەڵی نەوەشانیبێتەوەو هەرچی خراپەیەکیشی کردبێت هەر لەسەر خۆیەتی‌و هەموی لەسەر دەنووسرێت‌و سزا دەدرێت لەسەری مەگەر بەر عەفوی خوا کەوتبێت یان پێش مردنی تەوبەی لەو خراپانە کردبێت و پەشیمان بوبێتەوە.

ئینجا موسڵمانان دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لۆمەمان مەکە لەسەر ئەو شتانەی کە لە بیرمان چوبێتەوە یان بە هەڵە کردبێتمان، ئەی پەروەردگارمان باری گران مەدە بە سەرماندا وەك ئەوبارە گرانەی کەداوتە بە سەر ئۆممەتانی پێش ئێمەدا. جا کاتێ کە پێغەمبەر خوا ﷺ ئایەتی ئەی پەروەردگارمان تۆڵەمان لێ مەسێنە لەسەر لە بیر چوونەوەو هەڵەکانمانی خوێندەوە ﷻی خاوەن شکۆ فەرموی: بەڵێ، (واتە تۆڵەتان لێ ناسێنم) ئەم فەرمودەیەش راستەو موسلم هێنایەتیەوە.

(٢٨٦) ئەی پەروەردگارمان نەی دەیت بە سەرماندا ئەوەی کە لە توانامان دا نیەو چاوپۆشیمان لێ بکەو لە تاوانەکانمان خۆش ببەو رەحممان پێ بکەبە راستی هەرخۆت سەرپەرست‌و یارمەتی دەرمانی سا خوایە یارمەتیمان بدەوسەرمانبخە بە سەر گەلی کافران دا بەبەڵگەو بەغەزاو بەسەرکەوتنی ئایینەکەمان. ئەمە بو پاڕانەوەی موسڵمانان‌و ئەمە بو سیفەتی موسڵمانانی راستەقینە جا هەر کاتێك کە ئایەتێکی قورئان یان هەر کاتێك حەدیسێکی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ باس دەکرێت، ئەگەر عەقڵمان دەرکی ماناکەی نەکرد با عاقڵانە بیر بکەینەوەو بڵێین: بیستمان‌و پەیڕەوی دەکەین نەك نەفامانە عەقڵی خۆمان بکەین بە پێوەرو ئایەت‌و حەدیسی پێدا بکێشین‌و دەست بکەین بە بەرپەرچدانەوەی هەرشتێك کە عەقڵمان نەیگرت.

پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: {الْآيَتَانِ مِنْ آخِرِ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مَنْ قَرَأَهُمَا فِي لَيْلَةٍ كَفَتَاهُ/متفق علیه/ ئەم دوو ئایەتەی کۆتایی سورەتی بەقەرە هەرکەس بیانخوێنێ لەشەودا بەسن بۆی} وە دەفەرموێ: {أُعْطِيتُ خَوَاتِيمَ سُورَةِ الْبَقَرَةِ مِنْ بَيْتِ كَنْزٍ مِنْ تَحْتِ الْعَرْشِ، لَمْ يُعْطَهُنَّ نَبِيٌّ قَبْلِي/ا د، صححە الالبا / کۆتای سورەتی بەقەرە لە ماڵێکی خەزانەوە لە ژێر عەرشدا پێم بەخشراوە کە بە هیچ پێغەمبەرێکی پێش من نەدراوە}.

٣ سُورَةُ آلِ عِمۡرَانَ ٢٠٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُ ﴿٢﴾ نَزَّلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَأَنزَلَ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴿٣﴾ مِن قَبۡلُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَأَنزَلَ ٱلۡفُرۡقَانَۗ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٤﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٥﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُصَوِّرُكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ كَيۡفَ يَشَآءُۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٦﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَايَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٧﴾ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٨﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ جَامِعُ ٱلنَّاسِ لِيَوۡمٖ لَّا رَيۡبَ فِيهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٩﴾

٣ سورەتی ئالی عیمران ٢٠٠

سورەتی ئالی عیمران کە سورەتی سێهەمی قورئانە، دووسەد ئایەتە لە پاش سورەتی بەقەرە لە سەرتای هیجرەتی پێغەمبەرەوە ﷺ لە مەدینە دا ڕەوانەکراوە، هەر لە سەردەمی پێغەمبەرەوە بەم ناوە ناسراوە، لەم سورەتەدا باسی چاکیو گەورەی بنەماڵەی عیمرانی باوکی مریەمو زەکەریا پێغەمبەر عليه السلام کراوە، پێغەمبەر ﷺ سورەتی "بەقەرە" و سورەتی "ئالی عیمران"ی بە " **الزَّهْرَاوَيْن** " واتە "دوو گوڵ" ناو بردوە، فەرمانی داوە کە باوەڕداران فێریان ببن. پەیوەندی نێوان ئەم سورەتەو سورەتی پێشی زۆر ڕونە، زۆربەی ئەو حوکمانەی کە لەسورەتی پێشودا بەکورتی باسکراوە لەم سورەتەدا درێژەی پێدراوە، زانایان وتویانە هەرکات لەنێوان دوو سورەتدا نزیکیو یەك ڕیزیەکی زۆر بێت کۆتایی سورەتە دووهەمینەکە هەر ئەوباسەیە کە لە سەرەتای سورەتی یەکەمەوە هاتوە، لە سەرەتای سورەتی بەقەرەدا باسی موتەقیەکانو ڕزگار بونیان کرا، جا دەبینین لە کۆتای ئەم سورەتەدا دەگەڕێتەوە سەرباسی ئەوانو موژدەی بەهەشتیان پێدەداتو داوا لەباوەڕداران دەکات کە ئەهلی تەقوابن تاکو ڕزگاربن لە سزای پەروەردگار.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان.

﴿١﴾ سەرەتای سورەتەکە بەم پیتانە دەست پێ دەکات: (ئەلیف، لام، میم) ڕاسترو دروستر قسە ئەوەیە کە دوور کەوینەوە لەو هەمو قیلو قالێكو بلێین: باوەڕمان وایە ئەمانە بەشێك لەم قورئانەن کە لە لایەن پەروەردگارەوە دابەزیوەو هەرخۆیشی زاناترە کە مەبەستی چیە لەم پیتانە.

﴿٢﴾ خوا ئەو زاتەیە کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەتر نیە بێجگە لە خۆی کە زیندوەو هەمو شتێك بە هۆی ئەوەوە وەستاوە، کە ئەگەر وجودی ئەو نەبێت وجودی هیچ شتێکی تر نابێت.

﴿٣﴾ ئەو خوایەی کە ڕەوانەی کردۆتە سەر تۆ ئەی محمد ﷺ ئەم کتێبە کە قورئانە بەمەبەستێکی ڕەواو حەق کە دان دەنێت بەوەی کە لە پێش خۆی دا هاتوە وە باوەڕی بە ڕاستیو دروستی هەمویان هەیەو تەوراتو ئینجیلیشی لە پێش دا ڕەوانە کردوە.

﴿٤﴾ کە ئەوانە هەمویان لە کاتی خۆیاندا ڕێ پێشاندەر بوون بۆ خەڵك تا ئەو کاتەی گۆڕێندراون، وە فورقانیشی پاش ئەوان ڕەوانە کردوە کە ئەمەش ناوێکی تری قورئانە واتە جیا کەرەوەی ڕاستو ناڕاست، بە بێگومان ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕن بە نیشانەکانی خوا بۆ ئەوان هەیە سزایەکی دەرد ناك، بە ڕاستی خوا خاوەنی هێزوو دەسەڵاتە بۆتۆڵە سەندنەوە لە ستەمکارانو ملهوڕانو تاوانباران و لای ئەو زۆر ئاسانەو کەس ناتوانێت لە دەستی دەربچێت.

قورئان چوار ناوی هەیە (**الذکر، الكتاب، الفرقان، القرآن**).

﴿٥﴾ بە بێگومان اللّٰه نە لە زەویو نە لە ئاسماندا هیچی لێ ون نابێت. جا ئەوانەی کە تاوان دەکەن چی دەکەنو لە کوێ دا ئەو تاوانانەی خۆیان دەشارنەوە، هەر دەبێ بە کۆڵی تاوانەوە بچنە بەردەم دادگای خوای زاناو بەدەسەڵات.

﴿٦﴾ هەر خۆیەتی وێنەی کێشاون لە ناو منداڵدانو لە ناو سکی دایکانتاندا، لە ناو ئەو جێگا تەنگو تاریکە دا بەو شێوەی کە خۆی ئارەزۆی لێ بوە بێ ئەوەی دایكو باوك بتوانن لەو نەخشو نیگارەدا کەمترین دەسەڵاتیان هەبێت، بەڕاستی هەر خۆیەتی دروستکار کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر بێجگە لە ئەو نیە کە خاوەنی هێزو دەسەڵاتەو ئیشەکانیشی بە حیکمەتە. جا باسی ئەوەمان بۆ دەکات ئەوەی کە لەم کتێبە دا هاتوە کە دوو بەشە. بەشێکی (محکم)ەو بەشێکی تری (موتشابە)و دەفەرموێ:

﴿٧﴾ خوا ئەو زاتەیە کەئەم کتێبەی بۆ تۆ رەوانە کردوە ئەی محمد ﷺ کە لەو کتێبە دا چەندەها ئایەتی موحکم هەیە کە حوکمیان دەزانرێتو ئیشیان پێ دەکرێتو ماناکەیان زۆر رۆشنو ئاشکرایە کەئەوانە ئەسڵی کتێبەکەنو ئەو کتێبە بۆ ئەو مەبەستە رەوانە کراوە، وە هەندێکی تری ئاڵۆزەو لەیەك دەچنو چەندین مانا هەڵدەگرێت، جائەوانەی کە نەخۆشی لە ناو دڵیاندایە دوای ئەوانە دەکەون کە مانایان رۆشن نیە جا نەك بۆ ئەوەی ڕاستی بزانن، بەڵکوبە مەبەستی ئاشۆب دروست کردنو بە مەبەستی مانای نارێك، وە مافیان نەبو کەئەو رێگا هەڵەیە بگرنە بەر، چونکە مانای ئەو موتەشابیهانە نازانێت بێجگە لە خوای گەورە خۆی، وە ئەوانەی کەوا زۆر چونەتە خوارەوە لە عیلماو شارەزاییان لە تەوحیدو یەکتا پەرەستی دا زۆرە، دەڵێن: ئێمە ئیمانمان بەو ئایەتانە هەیەو لە لایەن خوای خۆمانەوە هاتوە، وە بێگومان سودێکی زۆری تێدایە بەڵام ئێمە دەرکی ناکەین، جا بیر ناکەنەوە لەم راستیانە مەگەر ئەوانەی کە خاوەنی ژیرین. واتە تەنها خاوەن عەقڵەکان لەمە بیر دەکەنەوەو سودی لێ وەردەگرن،

تێبینی:جۆری موتەشابیهەکانو موحکەمەکان:

یەکەم- لە بارەی مانای وشەکەوە:

١- قورئان هەموی موتەشابیهە واتە هەموی لە یەك دەچێت وەك لەم ئایەتە دا هاتوە کە دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ ﴾ **الزمر: ٢٣**/ خوا ئەو زاتەیەکە جوانترین قسەی رەوانە کرد وە کە پەراوێکەو ئایەتەکانی لە یەك تردەچن کە دووبارە ئەبێتەوە ﴾

٢- قورئان هەموی موحکەمە واتە: هەمو وشەکانی راستو رەوانو هی خوایە وەکو لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ ﴾ **هود: ١** / ئەمەکتێبێکە کە ئایەتەکانی موحکەمن لە پاشدا درێژەی پێدراوەو رۆشن کراوەتەوە لە لایەن داناو زۆر ئاگادارەوە کە الله یە﴾.

٣- هەندێکی قورئان موحکەمەو هەندێکی تری موتەشابیهە وەك لەم ئایەتەدا فەرموی جا ئەم جۆرە موتەشابیهانەش بە لای هەندێ زاناوە کەس نایزانێت بێجگە لە خوا خۆی کە ئەم رێگەیان بێ دەردی سەر ترە، وە بە لای هەندێکی ترەوە ئەوانەی کە زۆر شارەزا ببن لە خوا ناسیو یەکتا پەرەستی دا دەیزانن، کە ئیبنو عباس لە سەر ئەم باوەڕەیەو خۆی بە یەکێك لەوانە دەزانێت. من رەئی یەکەمیانم بەلاوە ئەهوەن ترەو دووهەمیش بە دوور نازانم ﴿ **شأن** **خلقه**﴾ بەڵام من وانازانم کەموتەشابیهی هەتا هەتایی لە قورئان دا هەبێت بەلامەوە وایە کەموتەشابیهەکان کاتین بۆ نمونە، سەلامی فریشتەکان لە پیاوی چاك لە کاتی سەرەمەرگ دا موتەشابیهە تا ئەو کاتە، بەڵام لەو کاتەدا چۆنیەتی سەلام کردنەکەیان ئاشکرا دەبێت بۆ کابرا، میزانو کێشانی کردەوەکان بۆ ئێمەو لە دنیادا موتەشابیهە، بەڵام کە گەیشتینە ئەو کاتەراستی دەزانینو لە موتەشابیهەکان دەردەچێت بینینی خوا لە رۆژی قیامەت دا موتەشابیهە بەڵام لەو کاتەی کە بینیمان ئیتر حەقیقەتی ماناکە دەردەکەوێت، وە هەروەها باقی موتەشابیهەکانی تر، هەر خوایش زانایە. لەوانەیە بپرسن دەی ئەگەر موتەشابیهەو مانای نازانین بۆچی هاتووە؟دەڵێین.

١- ئەو خوایەوخاوەنی هەموشتەو هەرچی بکات پرسیاری لێ ناکرێت ﴿ لَا يُسۡـَٔلُ عَمَّا يَفۡعَلُ وَهُمۡ يُسۡـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ **الأنبياء: ٢٣**

٢- مەرج نیە کەس مانای نەزانێت وەکو لە پێشەوە باسمان کرد.

٣- مەرج نیە هیچ کات مانای نەزانرێت وەك لە پێشەوە ئەویشمان باس کرد.

٤- ئەگەر بڵێین: هیچکەس نایزانێت وە هیچ کاتیش نازانرێت دووبارە ئەو دروستکارەو دوو پەڕاوی داناوە لە بەردەم ئێمە دا یەکێکیان ئەم قورئانەیە کە ئەیخوێنینەوەو ئەوی تریان ئەم بوونەوەرەیە هەروەکو لەم بوونەوەرەدا هەزاران شتی داناوە تا ئێستا ئێمە سودەکانیانمان نەزانیوە وەکو مارو دوپشكو مشكو پلنگو گورگو سەدان شتی تر، هەروەها لەم قورئانەدا ئەو ئایەتە موتەشابیهانەیشی داناوە ئەگەر هەر هیچ سودێکی نەبێت ئەو سودە گرنگەی هەیە کە بزانرێت کێ بەبێ چەندو چۆن فەرمانی خواو ئیشەکانی وەرئەگرێتو کێشی ئەمانە ئەکات بە بەهانەو خۆی لە خوا ناسیو بەندایەتی ئەبوێرێت واتە هیچ نەبێت هۆی تاقیکردنەوەی نەوەی ئادەمە کە ئێمەیش هەر بۆ ئەوە تاقی بکرێینەوە دروست کراوین ﴿ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ ﴾ **الملك: ٢** / واتە مەرگو ژیانی دروست کرد تا تاقیتان بکاتەوەو بزانێت کامتان کرداری جوانتر ئەکەن ﴾. رەحمەتی خوا لەشاعیری کورد مەولەوی کە دەڵێ : گەر زەرەیە شعور هەیە پێتەوە ، کەوتیان خودا ئە برێتەوە.

جا هەندێك لە سەر وشەی ﷲ لە ﴿ إِلَّا ٱللَّهُۗ ﴾ دا نەوەستاون بەڵکو لە سەر وشەی ﴿ ٱلۡعِلۡمِ ﴾ لە ﴿ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ ﴾ وەستاون واتە مانای ئەو ئایەتانە نازانن مەگەر خواو ئەو کەسانەی کە زۆر چونەتەوە خوارەوە لە عیلم دا کە لە پێشەوە وتمان: عبدالله ی کوری عەباس وای بۆ چوەو پێغەمبەریش ﷺ دوعای زیاتر زانینی

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ وَقُودُ ٱلنَّارِ ﴿١٠﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿١١﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٢﴾ قَدۡ كَانَ لَكُمۡ ءَايَةٞ فِي فِئَتَيۡنِ ٱلۡتَقَتَاۖ فِئَةٞ تُقَٰتِلُ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَأُخۡرَىٰ كَافِرَةٞ يَرَوۡنَهُم مِّثۡلَيۡهِمۡ رَأۡيَ ٱلۡعَيۡنِۚ وَٱللَّهُ يُؤَيِّدُ بِنَصۡرِهِۦ مَن يَشَآءُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿١٣﴾ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلۡبَنِينَ وَٱلۡقَنَٰطِيرِ ٱلۡمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلۡفِضَّةِ وَٱلۡخَيۡلِ ٱلۡمُسَوَّمَةِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ وَٱلۡحَرۡثِۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلۡمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ ۞ قُلۡ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيۡرٖ مِّن ذَٰلِكُمۡۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزۡوَٰجٞ مُّطَهَّرَةٞ وَرِضۡوَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ﴿١٥﴾

بۆ کردووەو فەرمویەتی: {اللهُم فَقهْهُ فِي الدين وَعَلمْهُ التأويلَ / متفق عليه/ ئەی پەروەردگار شارەزای بکەیت لە دینداو فێری تەفسیری بکەیت} وشەی (**التأويل**) بە دوو مانا هاتووە:

**یەکەم:** حەقیقەتی شت کە بەم مانایە چاك وایە لە سەر وشەی ﷲ بوەستیت، چونکە حەقیقەتو راستی ئەو شتە نهێنیانە تەنها ﷲ خۆی دەیزانێت.

**دووهەم:** تەئویل واتە تەفسیرو مانای وشە، ئابەم مانایە ئەگەر لە سەر وشەی ﴿ٱلۡعِلۡمِ﴾ بوەستیت باشە، چونکە ئەوان ماناو مەفهومی شتەکە دەزانن، عائیشەخوالێی رازی بێت دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوەوفەرموی: {فَإِذَا رَأيْتِ الذِينَ يَتبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ فَأُولَئِكِ الذِينَ سَمى اللهُ فَاحْذَرُوهُمْ/البخاری/ جا هەرکاتێ کەسانێك کە بە دوای ئەو بەشەئاڵۆزەدا کەوتن ئەوسا بزانن کە ئەوانەن خوا ناوی بردون ساخۆتانیان لێ بپارێزن} بەڵێ دنیا دنیایی تاقیکردنەوەیەو دڵەکان زۆر ئەم دیو ئەو دیو دەکەن بۆیە خاوەن باوەڕانی راست دەڵێن:

﴿٨﴾ ئەی پەروەردگارمان دڵەکانمان لا مەدە لەئایین پاش ئەوەی کە هیدایەتت داین‌و رێنمایت کردین‌و ببەخشە پێمان لە لایەن خۆتەوە رەحمەتو سۆز بە بێگومان تۆ هەر خۆتیت بەخشندە. لەمبارەوە ئوموسەلەمە دەڵێ: پێغەمبەری خواﷺ زۆرجار دەیفەرمو: {يَا مُقلبَ الْقُلُوبِ ثَبتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ قَالَتْ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ مَا أَكْثَرَ دُعَاءَكَ يَا مُقلبَ الْقُلُوبِ ثَبتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ قَالَ يَا أُم سَلَمَةَ إِنهُ لَيْسَ آدَمِي إِلا وَقَلْبُهُ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ فَمَنْ شَاءَ أَقَامَ وَمَنْ شَاءَ أَزَاغَ /رواه الترمذى وصححه الالبا / ئەی گوێڕێنەری دڵەکان دڵم سەقامگیربکە لەسەر ئایینەکەت. دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ چەندزۆر ئەودوعای (يَا مُقلبَ الْقُلُوبِ ثَبتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ) دەفەرموی؟! فەرموی ئەی ئوموسەلەمە بێگومان هیچ بنیادەمێك نییە مەگەر دڵی ئەو لەنێوان دووئەنگوست لە ئەنگوستەکانی خوادابێت جائارەزۆی لەهەرکەسێك بو، راست دەیوەستێنێ‌و کامیشی ئارەزۆلێ بو لای دەدات} وەئەوژییرانە دەڵێن:

﴿٩﴾ ئەی پەروەردگارمان بێگومان تۆ کۆکەرەوەی خەڵکی لە رۆژێکدا کە هیچ گومان لەهاتنیدا نیە کە رۆژی قیامەتە، بە بێگومان ﷲ پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکاتو هەر بەڵێنێکی دابێت جێ بە جێی دەکات.

﴿١٠﴾ بە بێگومان ئەوانەی کە کافرن نە ماڵ‌و نە ئەولادیان لە رۆژی قیامەتدا هیچ سودێکیان پێ نادات و هیچ حیسابێکیان بۆ ناکرێت لە سەر ئەم ئەولادانەی کە ئەوان لە دنیادا پارێزگاریان لێ دەکردن ئەوانە بە راستی سوتەمنی ئاگری جهەنمن وەك لە سورەتی تەحریمدا دەفەرموێ: ﴿ئەی خاوەن باوەڕان خۆتان‌و خاوخێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن کە هەڵگرێنەرو سوتەمەنی ئەو ئاگرە ئینسان‌و بەردە﴾

﴿١١﴾ هەروەکو نەریتی ئالی فرعەون‌و ئەوانەی کە لە پێش ئەمانەدا بوون کەبێ باوەڕ بون بە نیشانەکانی ئێمە، جا خوای گەورە گرتنی بە هۆی ئەو تاوانانەی کە کردیان لەدژایەتی موساو پەیڕەوانی‌و بە راستی خوا زۆر بە هێزە لە تۆڵە سەندنەوەدا. واتە ئا ئەو گەلە ئەی محمدﷺ کە دژایەتی تۆ دەکەن و بە گوێت ناکەن شتێکی تازە نین بەڵکو هەروەکو چۆن ئالی فرعەون لە پێشدا ئەمەیان دەکردو بێ باوەڕ بون بە نیشانەکانی ئێمە ئەمانەش هەروەك ئەوانن، جا پێویستە لە سەر ئەم گەلەش کەدژایەتی پێغەمبەرﷺ نەکەن بەڵکو بە چاکی گوێ بگرن لە بەرنامەکەی خوا چونکە ئەو تۆڵەی کە سەندرا لە فیرعەون چاوەڕێی ئێوش دەکات جا ئەگەر لە دنیاش دا تۆڵەتان لێ نەسەندرێت بێگومان لە قیامەت دا دوچاری سزای ئەم تاوانانە دەبن، خوای گەورە باسی فیرعەون‌و گەلانی پێشوی کرد تا زوو بێنەوە سەر هۆش‌و خۆیان گرفتاری بەڵاکانی ئەوان نەکەن، ئینجا خوای گەورە موژدە دەدات بە موسڵمانان‌و لەو لایشەوە دڵ ساردیەکی چاك دروست دەکات لە ناو دڵی کافران داو دەفەرموێ:

(١٢) ئەی محمدﷺ بڵێ: بە کافران هەر ئێستا ماڵو سەروەتو هێز کۆبکەنەوەو دژایەتی ئاینی خوا بکەن سەرئەنجام شکست دەخۆنو کۆ دەکرێنەوە بۆ جەهەنم. هەم لە دنیادا شکست دەخۆنو هەم لە قیامەتیشدا دەبرێن بۆ دۆزەخ، بە راستی دۆزەخ پیسترین جێگەیە بۆیان، ئینجا بۆ بە هێز کردنی بیرو باوەڕی خاوەن باوەڕان دەفەرموێ:

(١٣) بە راستی بۆ ئێوە هەیە لە تەماشا کردنی ئەو دوو کۆمەڵەی بە یەك گەیشتن لە شەڕ، مەبەستی شەڕی بەدرە کە کۆمەڵی موسلمانان بریتی بو لەسێ سەدودوانزە تاپانزە کەسو کۆمەڵی کافران نزیکەی نۆسەدوپەنجا تاهەزار کەس بون جاخوا وای کردبو کە کافران موسڵمانانیان دەبینی کە دوو بەرابەری خۆیانە، ئەگەر چی موسڵمانان کەم بون یەك بە سێ بون لە گەل کافرەکان دا ئەمە لە کاتێکا بوە کە شەڕ دەستی پێ کردوە ئەگینا لە پێش شەڕەکەدا هەم کافرەکان موسڵمانەکانیان بە لاوە کەم بووە هەم موسڵمانەکانیش کافرەکانیان بەلاوە کەم بوە، جا ئەم شێوە بۆ موسلمانان هەر وا مایەوە بەلاّم لە کاتی شەڕا بۆ کافرەکان وەکو فەرموی: گۆڕا، بەلاّم بۆ لە پێشەوە وا بو؟ خوا دەفەرموێ:﴿ لِيَقْضِيَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ﴾ **الأنفال: ٤٤**/ تا خوا ئەو حوکمەی کە خۆی بڕیاریداوە جێ بە جێی بکات﴾ کە ئەوەبولەسەرانی کوفر چەندین پیاوی گەورەی وەکو ئەبوجەهلو چەندین کەسی تر کوژران، بە کورتی حەفتا کەسیان لێ کوژراو حەفتا یشیان بە دیل گیرا، بەلاّم موسڵمانان پانزە کەسیان لێ شەهید بو، جا ئەگەر کافرەکان لە پێشەوە بیانزانیبایە کە موسڵمانەکان ئەوەندە بە هێزن هەر لە سەرەتاوە شەڕیان نەدەکردو ئەو دەسکەوتە گەورەیە دەستی موسڵمانان نەدەکەوت، بەلاّم ئەوەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێت کە شەڕ کردنو جیهاد کردن لە ڕێگای خوادا ئەوەندە پیرۆزە هەتا خوا خۆی هۆیەکانی بۆ دروست دەکات ئینجا ئاکامی ئیش هەر بە دەست خوایە وەك دەفەرموێ: بەراستی خوا بە هێز ئەکات بە پشتیوانیو یارمەتی خۆی ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت بەبێگومان ئا لەم داستانەدا واتە لە شەڕی بەدردا ئامۆژگاریەکی گەورە هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە خاوەنی بیری ڕۆناکن، ئینجا خوای گەورە هەندێك لە نیعمەتە دروستکراوەکانی خۆیمان بۆ باس دەکاتو تێمان دەگەیەنێ کە ئەمانە نیعمەتێکی کاتین، واتە بە ئەمانەوە خۆتان زۆر خەریك مەکەن چونکە نیعمەتی گەورەترتان بۆ هەیە لە دوا ڕۆژداو دەفەرموێ:

(١٤) جوان کراوە بۆ خەڵك خۆشەویستی ئارەزۆکان لە ژنان واتە خوای گەورە بۆ ئاوەدان کردنەوەی دنیاوای بڕیار داوە کە پیاو ژنی خۆش بوێتو کوڕانی بۆ جوان کراوە واتە کوڕانیان زۆر پێخۆشەو ماڵی زۆر لە زێڕو لە زیو یان لە لا جوانکراوەو پێیان خۆشە، هەروەها جوانکراوە لایانو پێیان خۆشە ئەسپی مۆچێنراو تەعلیمیو دیاری کراوو مەڕو ماڵاتو کێڵگە کە ئەمانە هەمو شتانێکن کە خەڵك بە گشتی حەزیان لێیەتیو هەوڵی بۆ دەدەن تا بە دەستیان بهێنن، چونکە خوای گەورە دەیەوێت ئەم زەوییە ئاوەدان بکاتەوە، جا ئەگەر ئەو خۆشەویستیە نەبێت ئەم زەوییەئاوەدان نابێتەوە، خۆ کابرا ئەگەر خۆشەویستی ژن نەبێت ناچێت کرێکاری بکاتو زەحمەت بکێشێتو پارە کۆ بکاتەوە تا ژنێك بهێنێتو بە خێوی بکات، وە ئەگەر خۆشەیستی منداڵی نەبێت شەش حەوت منالّ بە خێو ناکات، بەلاّم ئەو خۆشەویستیە وای کردوە کە ئەو رەنجو زەحمەتەی بەلاوە گرنگ نەبێت، بەلکو زۆریش پێی خۆشەو خۆی بە بەختەوەر دەزانێت، بەلاّم پێویستە مرۆڤ ژیر بێتو پاشە ڕۆژی خۆی لە بیر نەچێتەوە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ئەوە هەموی خۆشیو لەزەتێکی ژیانی دنیاییەو کاتیەو لە دەست دەچێت، وە لە لای خوایە چاکترین جێگاو پاداشت:

(١٥) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئایا خەبەرتان بدەمێ بە چاکتر لەمانەی کە باسمان کرد؟ بۆ ئەوکەسانەی کە دەترسن لە خوای خۆیان چەندین باخچە هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا کەلە ژێر ئەو باخچانەدا چەندین جۆگا دەڕوات، وەك لە سوڕەتی محمد دا باسی دەکات جۆگەیەکیان لە ئاوەو هەرگیز خراپ نابێتو جۆگەیەکیان لە شیرەو جۆگەیەکیان لە شەرابەو جۆگەیەکیان لە هەنگوینی پاڵفتە کراوە، ئەو چوار جۆگەیە لە ژێر کۆشکی هەمو موسڵمانێك دا دەڕوات کە بۆ هەمیشەش تێیدا دەمێننەوەو ناترسن لەوەی کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو نیعمەتانە ببڕێت یان لەو شوێنە خۆشەدا دەربکرێن، وە بۆیان هەیە ژنانێکی پاك کراوە نە دەکەونە عوزرەوەو نە شتێکی ناشیرینیان پێوە دەبێت، بۆیان هەیە رەزامەندی لە لایەن خواوە کە ئەمە لە هەمویان گەورەترو خۆشترە، وەبەراستی خوا بینەری بەندەکانیەتیو دەزانێت کێ چی دەکاتو کێ شایستەی چ جێگایەکەو کام مەقامەی پێ بدرێت، جا کێن ئەو بەندانەی خوا کە ئەو هەمو نازو نیعمەتەیان پێ دەدرێت؟ دەفەرموێ:

ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ إِنَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٦﴾ ٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْمُنفِقِينَ وَٱلْمُسْتَغْفِرِينَ بِٱلْأَسْحَارِ ﴿١٧﴾ شَهِدَ ٱللَّهُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَأُوْلُواْ ٱلْعِلْمِ قَآئِمَۢا بِٱلْقِسْطِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ وَمَا ٱخْتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ بَغْيَۢا بَيْنَهُمْ وَمَن يَكْفُرْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿١٩﴾ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ فَإِنْ أَسْلَمُواْ فَقَدِ ٱهْتَدَواْ وَّإِن تَوَلَّوْاْ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقْتُلُونَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَيَقْتُلُونَ ٱلَّذِينَ يَأْمُرُونَ بِٱلْقِسْطِ مِنَ ٱلنَّاسِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْآخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٢﴾

﴿١٦﴾ ئەوانە ئەو كەسانەن كە دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە سا لە گوناهەكانمان خۆش ببەو لە سزای ئاگر بمانپارێزە. پارانەوەی ئەمانە تەنها بە قسەو زمان نییە بەڵكو ئەوانە ئا بەو شێوەیە لە خوا دەپارێنەوەكە:

خۆگرانن. خۆگرتن لە سەر سێ شتە:

**یەكەم**: خۆ گرتن لە سەر عیبادەت. **دووهەم**: خۆگرتن لە سەر نەكردنی خراپە.

**سێهەم**: خۆگرتن لە سەر بەڵاو گرفتاری دنیایی،جا هەر كەسێك ئاوەها خۆگر بو خوای گەورە خۆشی دەوێت، وە راستگۆیان ئەوانەی كە راست دەكەن لە گەڵ خواو پێغەمبەرەكەیداو بەرنامەی خوا بە راستی هەڵدەگرن نەك بە شێوەی دووڕویی، وە ئەوانەی كە گەردن كەچن بۆ ئەنجام دانی فەرمانەكانی خواو ئەوانەی كەلە بەخشینی ماڵو عیلمو دانایی دا درێغی لەكەس ناكەنو لە بەر رەزای خوا دەیبەخشنو لەو بەخشینەشدا بەسەر كەسدا منەت ناكەن ، چونكە ئەوان دەزانن لە هەمو شتێكدا زەكات هەیە، وە ئەوانەی كە بەرەوبەیانی لە خوا داوا دەكەن، **سحر**: نیو ساعەتێك پێش نوێژی بەیانیە، لەو كاتەدا خوای گەورە دابەزیوەتە سەر ئاسمانی یەكەمو دەفەرموێ: كێ چی دەوێت با داوام لێ بكات، وە لە كاتی نەمانی شەودا سەردەكەوێت، چۆنیەتی ئەودابەزێن و سەردەكەوتنە لەعەرشەوەو بۆ سەر عەرش هەرخۆی دەزانێوئێمە باوەڕمان پێی هەیە كە دادەبەزێت وە سەردەكەوێت، جا لەو كاتەدا دوعا وەردەگیرێت، ئەوە بو لەو كاتەدا كە یەعقوب یوسفی دۆزیەوە، براكانی داوایان لێ كرد كە دوعامان بۆ بكات وتی: لە مەو لا دوعاتان بۆ دەكەم واتە با كاتی سەحەر بێت دوعاتان بۆ دەكەم:

﴿١٧﴾ ﷲ خۆی شایەتی دەدات كە هیچ پەرەستراوێكی راستەقینە نیە بێجگە لە خۆی كە سەرپەرشتیكەرو بەرێوەبەری تەواوی ئەم بونەوەرەیە بەدادپەروەرانەو هەرخۆیەتی دەسەڵاتدارو دانا، هەروەها فریشتەكان و ئەوانەی كە خاوەنی زانیارین، هەمویان شایەتی دەدەن كە هیچ مەعبودێكی بە حەق نیە كە مافی پەرستنی هەبێت بێجگە لە ﷲ. دەبینین لەم ئایەتەدا خوای گەورە لە گەڵ خۆیدا باسی فریشتەكانی كردووەو پاش ئەوانیش باسی خاوەن عیلمەكانی كردوە، ئەمە نیشانەی ئەوەیە كە خاوەنی زانینی راستەقینە كە یەكتاپەرستی راستەقینەیە لای پەروەردگار زۆر رێزیان هەیە، وەك لە سورەتی موجادەلە دا دەفەرموێ: ﴿خوای گەورە پلەی ئیمانداراانی بەرز كردۆتەوە، وە ئەوانەی كە زانایان پێ دراوە چەندین پلە بەرزترن لەوان ﴾ وە هەروەها دەفەرموێ: ﴿ئایا خوێندەوارو نەخوێندەوار وەك یەك وان؟﴾ الزمر:٩ كەواتە پەروەردگار خۆیو فریشتەكانو زانایانی كردوە بە بەڵگە لە سەر تەنیایی خۆی؟!

﴿١٩﴾ بە راستی ئایین لە لای خوا تەنها ئیسلامە واتە ئەو ئایینەی كە پەسندە لە لای خودا تەنها ئیسلامەو غەیری ئەو هیچ ئایینێكو رێبازێكی تر وەرناگیرێت. وەك لە ئایەتێكی تردا لەم بارەیەوە دەفەرموێ:﴿ هەر كەسێك غەیری ئیسلام رێبازێك بۆ خۆی قەبوڵ بكات خوای گەورە لێی وەرناگرێت و لە رۆژی قیامەتدا لە زیانكارانن﴾ ئالی عمران /٨٥ ئینجا لێرەدا دەفەرموێ: خۆ ناكۆكیان نەبو ئەوانەی كە كتێبیان پێ درا بو هەتا ئەو كاتەی ئەم زانینە راستە كە قورئانەهاتە لایان واتە ئەو كەسانەی كە ئینجیلو تەوراتیان پێ درابو ناكۆكیان لەوەدا نەبوە كە پێغەمبەرێكی تر دێت، وە ئەو پێغەمبەری كۆتایی دەبێت و سیفاتی ئەو پێغەمبەرەیان لا ئاشكرا بووەو هیچ ناكۆكیان نەبوە هەتا ئەو كاتە كە هات بۆ لایان، ئینجا ناكۆكیان تێ كەوت باوەڕیان بەو پێغەمبەرە نەهێنا هەرچەند وەكو كوڕی خۆیان دەیان ناسی، ئەی بۆ باوەڕیان پێ نەكرد؟ تەنها لە بەر ئیرەییو حەسادەت بو، چونكە چاوەڕێ بون كە ئەو پێغەمبەرە لە خۆیان بێت نەك لە عەرەب، ئینجا خوا دەفەرموێ: وە ئەو كەسەی كە بێ باوەڕ بێت بە نیشانەكانی خوا با بزانێت كە ئەو ناتوانێت هیچ زیانێك لە خوا بدات، بەڵكو خۆی توشی زیان دەبێت، بە بێگومان كە ﷲ زۆر بە پەلەیە لە حیسابدا. لە فەرمودەدا هاتوە

کە: موحاسەبەی ئەو هەموخەڵکە لە یەك كاتدا بەماوەی نیو رۆژ دەکرێت:

(٢٠) جا ئەی محمد ﷺ ئەگەر ئەوان دەمبازی دەکەن لە گەل تۆدا لە بارەی ئەم ئاینەوە سا تۆ بڵێ من گەردن کەچم بە تەواوی بۆ خوای خۆم، هەر وەها ئەو کەسانەش کەپەیڕەوی منن گەردەن کەچن بۆ فەرمانی خودا. جا ئەو کەسەی کە دەڵێت من شوێن کەوتەی پێغەمبەرم ئەبێ ئا بەو شێوەیە خۆی بە تەواوی تەسلیمی بەرنامەی خوا بکات، ئینجا راست دەکات کە پەیڕەوی پێغەمبەرەﷺ ئینجا خوا دەفەرموێ: بڵێ: بە ئەو کەسانەی کە خاوەنی کتێبن و ئەوانەی کەنەخوێندەوارن واتە بەجولەکەو گاورو موشریکان بڵێ: ئایا ئێوە گەردن کەچ دەبن بۆ خواو بۆ بەرنامەکەی؟ ئەوسا ئەگەر ئەوانیش هاتنو گەردن کەچ بون بەراستی ئەوانیش رێگای هیدایەتیان گرتوە، وە ئەگەر پشتیان تێ کردو گوێیان نەدا بەو ئاینە ئیتر لەمە نائومێد مەبە، تۆ تەنیا راگەیاندنت لە سەرەو خوا بینەری بەندەکانیەتی، خۆی دەزانێت چی دەکەن ئەوسا هەر ئیشێکی خراپ بکەن لە کاتی خۆی دا تۆڵەی وەردەگرن، ئینجا خوای گەورە باسی هەندێ لەسیفەتی کافران دەکاتو دەفەرموێ:

(٢١) دیارە ئەم روداوانەهەمویان لە پێش پێغەمبەرداﷺ رویان داوە چونکە دوای هاتنی پێغەمبەر ﷺ هیچ پێغەمبەرێکی تر نایەت تا ئەوان بیکوژن واتە بە شێوەی ئاینده دەفەرموێ: تا ئەو کاتەو ئەو ئیشە خراپەی ئەوان وەك روداوێکی تازە بخاتە بەر چاومانو بیبینین.دەفەرموێ: ها ئەو کەسانەی کەوا کافر دەبن بە ئایەتەکانی خواو خەریکن پێغەمبەرانو پیاو چاکانێ کە فەرمان دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە دەکوژن دەی ئەی محمدﷺ مژدەیان پێ بدە بە سزایەکی دەردناك. چونکە ئەوان ئێشو ئازار بۆموسڵمانان دروست دەکەن و سزاکەشیان بە گوێرەی کردارەکەی خۆیانە.

(٢٢) ئەمانە هەرچی کرداری چاکیان هەیە لە دنیاو لە قیامەتدا هەڵدەوەشێتەوەو بۆ ئەوان هیچ یارمەتی دەرێك نیە کە رزگاریان بکات لە سزای خوا لە رۆژی دواییدا. لە دنیادا هیچ حیسابێکیان بۆ ناکرێت چونکە ئەگەر ئیشێکی باشیان کرد بێت مادام پیاوی چاکیان کوشت ئیتر ئەوان خۆیان نرخیان نامێنێتو خەڵك رێزیان بۆ دانانێتو لە رۆژی دوایشدا سزای سەختیان هەیە نەك پاداشتی چاك، جا لە پاش باسی پێغەمبەران باسی ئەو کەسانە دەکات کە فەرمان دەدەن بە دادگەری ئەگەر چی ئەمانە پێغەمبەریش نەبوون هەتا ئەگەر لە خواروی زانایانیش بن واتە نەخوێندەوار بن مادام هەمیشە حەز لە دادپەروەری بکەنو

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ يُدْعَوْنَ إِلَىٰ كِتَـٰبِ ٱللَّهِ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُمْ وَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٣﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمْ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾ فَكَيْفَ إِذَا جَمَعْنَـٰهُمْ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ وَوُفِّيَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ مَـٰلِكَ ٱلْمُلْكِ تُؤْتِى ٱلْمُلْكَ مَن تَشَآءُ وَتَنزِعُ ٱلْمُلْكَ مِمَّن تَشَآءُ وَتُعِزُّ مَن تَشَآءُ وَتُذِلُّ مَن تَشَآءُ ۖ بِيَدِكَ ٱلْخَيْرُ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٦﴾ تُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَتُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ ۖ وَتُخْرِجُ ٱلْحَىَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَتُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَىِّ ۖ وَتَرْزُقُ مَن تَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢٧﴾ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾

ئەوەی کە دەیزانن بە دادپەروەرانە رەفتاری تێدابکەن پلەیان ئەوەندە بەرز دەبێتەوە خوای گەورە وای حیساب دەکات کە ئەگەر یەکێك لە ئەوان بکوژرێت وەك ئەوە وایە کەیەکێك لە پێغەمبەران بکوژرێت. دادپەروەری ئەوەندە شتێکی گرنگە لە روانگەی ئیسلامەوە. لە راستیدا ئەم دنیایە لە سەر دادپەروەری دامەزراوە، بۆ؟ چونکە لە سەر وجودی خوایە کە ئەویش هەمو بڕیارەکانی دادپەروەرانەیەو ئەگەر لەم ژیانەدا دادپەروەری نەما کاروباری دنیا هەموی تێك دەچێت وەك ئەمڕۆ کە دەیبینین ئەو هەمو زوڵمو زۆرو تەعەدایە دەکرێت لە سەرانسەری جیهاندا هەموی بە هۆی نەبونی دادپەروەرییەوەیە، ئینجا دەفەرموێ:

(٢٣) تۆ نابینی ئەو کەسانەی کە بەشێك لە کتێبیان پێ دراوە واتە جولەکەوفەلەکان، بانگ دەکرێن بۆ لای کتێبەکەی خوا کە قورئانە بۆ ئەوەی کە حوکم بکات لە نێوانیاندا کەچی پاش زانینی راستی هەندێکیان پشتی تێ دەکەنو ئەوان بەو قورئانە رازی نین.

(٢٤) لە بەر ئەوەی ئەوان دەیانوت: ئێمە چەند رۆژێك نەبێت ئیتر ئاگری دۆزەخ نامان سوتێنێت، گوایە ئەوان دەڵێن: دنیا هەموی حەوت هەزار ساڵە بۆ هەر هەزار ساڵ یەك رۆژ ئێمە دەخرێینە دۆزەخەوە، واتە ئێمە لە رۆژی قیامەتدا تەنها حەوت رۆژ سزا دەدرێین، جا بەو بۆچونە هەڵەو درۆیەی کەهەڵیان

بەستوە خۆیان بێ ئاگا کردووە لە سەر ئەو بیرو باوەڕە هەڵەیەبەردەوامن.

(٢٥) سا دەبێ وەزعی ئەوان جونبێت کاتێك کە ئێمە کۆیان دەکەینەوە لە ڕۆژێك دا کە هیچ گومانی تێدا نیە کە ڕۆژی قیامەتەو هەموو کەسێك بەرهەمی ئەو کەسابەتەی کە کردویەتی وەردەگرێتەوەو ئەوانە ستەمیان لێ ناکرێتو هەر کەس بە ئەندازەی خۆی لە چاکەو لە خراپە پاداشو سزا وەرئەگرێت. بەم شێوەیە خوای گەورە پوچەڵی قسەکانیانی دەرخست، ئینجا خوای گەورە باسی عەزەمەتو دەسەڵاتی خۆیمان بۆ دەکات و دەفەرموێ:

(٢٦) ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەی خودایە کە تۆ خاوەنی هەمو موڵکی موڵك دەدەی بەو کەسەی کە ئارەزۆت لێ بێت واتە دەسەڵات ئەدەی بە ئەو کەسەی کە ئارەزۆت لێ بێتو دای دەرنێ موڵك لە کەسێك کە ئارەزۆت لێ بێتو عەزیزوبەدەسەڵاتی دەکەیت ئەو کەسەی کە ئارەزۆت لێ بێتو زەلیلو سەر شۆڕی دەکەیت ئەو کەسەی کە ئارەزۆت لێ بێت، هەرچی چاکە هەیەبە دەست تۆیە بێگومان کە توانایيت بەسەر هەموشتێکدا هەیە. جائەگەر ئێمەی موسڵمان لەو بارەیەوە ئەوەندە بیرو باوەڕمان چاك بوایەو بەرزیو نزمیو بوونو نەبوون هەمو هەر بە موڵکی خوامان بزانیبایەو باوەڕمان وابوایە کە هیچ کەسێك لەم بارەوە هیچی لە دەست دا نیە ئەمڕۆ ئەم پیاوە نەدەبوین و دوژمن ئاوەها سەری نەئەکردە کەلاکمانو بە زیاتر لە ملیاردونیوێك موسڵمان ئاوەها زەلیلو سەر شۆڕ نەدەبوین. ئینجا فەرموی:﴿بيدك الخير﴾ خوایە بە دەستی تۆیە خێر، ئەڵبەتە شەڕیش هەر بە دەستی خوایە، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت لەم بوونەوەردا هیچ شتێك بکات تەنها بە ئیرادەی خوا نەبێت، بەڵام نیسبەتی شەڕ نادەینە لای خوا لە بەر ئەدەب. لە ڕاستی دا هیچ شتێك شەڕ نیە بە نیسبەت خواوە، چونکە شەڕ ئەوەیە کە هەر زیانی هەبێت جا ئەگەر خوای کار بەجێ کافران هەمویان توشی شەڕو بەڵاو موسیبەت بکاتو ئەگەر هەمو ئینسانە چاکەکانیش تووشی بەڵاو موسیبەت بکات بەڵێ ئێمە بە شەڕو خراپەی دەزانین بەڵام لە ڕاستی دا شەڕ نیە، چونکە کافران هەتا زیاتر تووشی بەڵاو موسیبەت بن تاوانیان کەمتردەکاتەوەو لە قیامەتدا لەسزایان کەمتر دەبێتەوەکەوابو ئەو بەڵاو موسیبەتانە خێرە بۆ ئەوان، موسڵمانانیش هەرچەندە توشی بەڵاو موسیبەت ببن پاداشەکەیان گەورەتر دەبێت کەوابو بۆ ئەوانیش هەر خێرە ئەگەر چی لە ڕواڵەتا ئێمە بە شەڕی دەزانین کەوابو هەر خێر لای خوایەو وجودی شەڕ لای خودا نیەو ئەوەش کە بەڕواڵەت شەڕ بێت بە هۆی مەخلوقی خواوەیە، لەم قسەیە ورد بەرەوە!

(٢٧) ئەی خوایە تۆی کە شەو دەخەیتە ناو ڕۆژەوەو ڕۆژ دەخەیتە ناو شەوەوە. کەدەبینین هەندێ جار شەو درێژ دەبێت وە هەندێ جاریش ڕۆژ درێژ دەبێتەوە، وە تۆ ئەو زاتەی کە زیندو لە مردو دروست دەکەیت کەدەبینین لە هەمو تۆیەك بەروبووم دروست دەبێتو لەدڵۆپەئاوێکی بێ گیان ئینسان دروست دەبێتو لە هێلکە مریشكو هەر بەم شێوەیە هەمو جۆرە باڵندەیەك دروست دەبێت هەروەها موسڵمان لە کافر پەیدا دەبێت چونکە لە ڕاستی داموسڵمان بە ئیمانەکەی بە زیندو حیساب دەکرێتو کافر بە هۆی بێ باوەڕیەکەیەوە بە مردو حیساب دەکرێ، وە تۆ مردو لە زیندو پەیدا دەکەیت و نوتفەی مردو لە ئینسانی زیندو هێلکە لە باڵندەو کافر لە موسڵمان، بە ڕاستی ئەی خوایە تۆ ڕۆزی دەدەیت بە هەر کەسێك کە ئارەزۆت لێ بێت بە بێ ژمارەو کەس ناتوانێت ڕێگات لێ بگرێت، هەر بەو بۆنەی کە فەرموی: موڵك بە دەست خوایە و عیزەتو زللەت هەر بە دەست خوایە دەی کەوابو:

(٢٨) نابێ باوەڕداران بێجگە لە باوەڕداران کافران بکەن بە دۆستی خۆیان. واتە حەقیان نیە کەوا غەیری ئیمانداران بکەن بە دۆست بۆ خۆیان، چونکە موڵك بە دەست خوای گەورە خۆیەتی ئیتر بۆ غەیری ئیماندار ئەکەی بە دۆستو ئەتەوێت چیت بۆ بکات؟ دەوڵەمەندت کات؟ بەرزت بکاتەوە؟ ئەی نەتزانی کە هەر خۆیەتی ئەمانە ئەکات؟ بۆیە دەفەرموێ: هەر کەسێك ئاوەها بکات ئەوە لە لایەنی خواوەهیچ حیسابێکی چاکی بۆ ناکرێت مەگەر ئەو دۆستایەتیەی بۆ ئەوە بێت کە خۆی بپارێزێت لە شەڕی ئەوان ئەگینا دۆستایەتی بێ باوەڕان تاوانەو نابێ موسڵمانان تۆخنی ئەو تاوانە بکەونەوە، چونکە ئەوان هەرگیز ڕاستیان نیە لە گەل خاوەن باوەڕانداو هەر کات هەلیان بۆ هەڵکەوێت نایبوێرن، جا ئەگەر ترسی شەڕی ئەوانی بو دەتوانێت بە ڕواڵەت خۆی وا پێشان بدات کە دۆستیانە وەکولەئەبودەرداوەهاتوەکە:(إنا لَنَكْشِرُ فِي وُجُوهِ أَقْوَامٍ وَإِن قُلُوبَنَا لَتَلْعَنُهُمْ/البخاری/ بێگومان ئێمە دەمو چاومان گوشادە دەکەین لەگەل تاقمێکدا بەڵام دڵمان نەفرینیان لێ دەکات).

بە داخەوە ئەمڕۆ ڕۆڵەی موسڵمان بە ڕواڵەت خۆی چاك پێشان دەدات کەچی نەك دۆستایەتی بەڵکو جاسوسیان بۆ دەکات؟! وەخوای گەورە خۆی لە نەفسی خۆیتان دەترسێنێتو دەفەرموێ: بترسن لێم. ئەمەش لە دڵسۆزی خۆیەتی ئەگینا خوا خاوەنی دەسەڵاتەو لە کەس ناترسێو دەتوانێ باس نەکات تا دەگەینە

خزمەتی، چونکە هەر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە، واتە هەرچی بکەی هەر بۆ لای خوا دەگەڕێیتەوە.

تێبینی: ئیسلام دینی ئاشتیو دۆستایەتیو راستیەو هەمیشە راستی پێ خۆشە، بەلام چی بکەیت ئەم ئینسانە زۆر لاسارەو سودی خۆی ناوێتو بە درێژایی مێژوو هەتا رۆژی قیامەتیش زۆربەی هەرە زۆری دژایەتی رێگای بەختەوەریو رێگای راستی دەکاتو ژیری خۆی بە لاوە لە بەرنامەو قسەکانی خوای بە راستترو چاکتر دەزانێتو کۆمەلێکی کەم هەمیشە باوەڕ بە قسە راستو دروستەکانی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ دەکەن جا ئەم کۆمەلە کەمە، چونکە بەرنامەکەی راستەو خۆشبەختی خۆیو خەلکی دەوێت بێ باکانە دێتە مەیدانەوەو ئەوەی کە راست بێت دەیسەلمێنێتو ئەوەی ناراستیش بێت دژایەتی دەکاتو بە وتاروبەکردارپوچەلی دەکاتەوە بۆیە هەمیشە راستە لە کردارو لە وتاری خۆی دا، بەلام جاری واش دەبێت ناچار دەبێت بەوەی کە بیرو باوەڕی خۆی بشارێتەوەو روالەتی پێچەوانەی ناو دەرونی بێت ئەم ئایەتەی تەفسیرمان کرد بۆ ئەو جۆرە کاتانەیە نەك بۆ هەمیشە، چونکە (التولیوالتبری/ دۆستایەتیو دژایەتی) دوو شتی بیرو باوەڕینو نابێت بگۆڕێت خاوەن باوەڕ دەبێت هەرموسلمانان بە دۆستو یارمەتی دەری خۆی بزانێتو بە دل ئەم قسەیە وەرگرێتو بە قسەو کرداریش بی سەلمێنێت بە مەیان دەوترێت (التولی) وە دەبێ بێزاری خۆی سەبارەت بێ باوەڕان دەربڕێتو هیچ کات نەیانکات بە یارمەتی دەری خۆی ودۆستایەتیان لە گەل دا نەکات

لە سورەتی مائیدە/ ٥١ دا دەفەرموویت ﴿ ئەی خاوەن باوەڕان جولەکەو فەلە نەکەن بە دۆستو یارمەتی دەری خۆتان ئەوانە هەندێکیان یارمەتی دەرو دۆستی هەندێکیانن هەر کەس لە ئێوە کە ئەوان بکات بە دۆستو یارمەتی دەر بە راستی لەریزی ئەوان دەژمێررێت، وە بە راستی خوا یارمەتی گەلی ستەمکار نادات﴾ وە لە سورەتی مومتەحینە /١دا دەفەرموێ: ﴿ئەی خاوەن باوەڕان دوژمنانی منو دوژمنانی خۆتان نەکەن بە دۆستی خۆتان﴾ وە لە سورەتی النساو -١٣٩ دا دەفەرمووێ:﴿ئەو کەسانەی کە لەباتی خاوەن باوەڕان کافران دەکەن بە دۆستو یارمەتی دەری خۆیان ئایا دەتانەوێ بە بۆنەی ئەوانەوە دەسەلات پەیدا بکەن؟ نەکەن شتی وا چونکە سەرچاوەی تەواوی دەسەلات تەنها لە خواوەیە﴾. واتە ئەگەر هێزو دەسەلاتت دەوێت تەنها لە خواداوابکەو رێبازەکەی ئەوهەلگرەو بەس، بەلکو بەم ئیشە باوەڕدار دەکەوێتە باروودۆخێکی خراپەوە لە بارەی بیرو باوەڕییەوە ئەوەتە هەر لە سورەتی نیسادا دەفەرموێ: ﴿ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بێ باوەڕان مەکەن بە یارو یاوەری خۆتان لەباتی ئیمانداران، ئایا

يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰٓ ءَادَمَ وَنُوحًا وَءَالَ إِبْرَٰهِيمَ وَءَالَ عِمْرَٰنَ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٣﴾ ذُرِّيَّةًۢ بَعْضُهَا مِنۢ بَعْضٍ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٤﴾ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّى نَذَرْتُ لَكَ مَا فِى بَطْنِى مُحَرَّرًا فَتَقَبَّلْ مِنِّىٓ ۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا وَضَعَتْهَا قَالَتْ رَبِّ إِنِّى وَضَعْتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا وَضَعَتْ وَلَيْسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلْأُنثَىٰ ۖ وَإِنِّى سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّىٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٣٦﴾ فَتَقَبَّلَهَا رَبُّهَا بِقَبُولٍ حَسَنٍ وَأَنۢبَتَهَا نَبَاتًا حَسَنًا وَكَفَّلَهَا زَكَرِيَّا ۖ كُلَّمَا دَخَلَ عَلَيْهَا زَكَرِيَّا ٱلْمِحْرَابَ وَجَدَ عِندَهَا رِزْقًا ۖ قَالَ يَٰمَرْيَمُ أَنَّىٰ لَكِ هَٰذَا ۖ قَالَتْ هُوَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٧﴾

دەتانەوێت بە دەستی خۆتان بەلگەیەکی ئاشکرا بدەنە دەست خوا لەسەر خۆتان کە سزاتان بدات.﴾

جا کەوا بو پێویستە خاوەن باوەڕان ئاگایان لە خۆیان بێتو بیرو باوەڕەکەی خۆیان بە فیڕۆ نەدەن، تەماشاکەن لێرەش پاش ئەوەی لەو خوو رەوشتە پیسە ترساندنی، ئینجا هەڕەشەمان لێ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٩) پێیان بلێ: ئەگەر بیشارنەوە ئەوەی کە لە ناو دلتاندایە یان ئاشکرای بکەن جیاوازی نیە لە لای خوا چونکەلە هەردوو حالەتتدا خوا پێی دەزانێت. ئایا کەسێك کە خۆی شتەکەی دروست کردوە و ورد بینەو بە خەبەر لە هەمو شت، ناگونجێت کەئاگای لێی هەبێت؟ خودا خۆی خەتەرەکە دروست دەکات لە ناو دلی کابرادا ئیتر چۆن دەبێ خۆی نەزانێت ئەو خەتەرە چیە لە ناو دلی ئەودا یە هەروەك دەفەرموێ: خوا عیلمی هەیە بەوەی کە لەناو ئاسمانانو زەوی دایە کە ئینسانیش بەشێکە لەو شتانە، وە بە راستی خوا توانایی بە سەر هەمو شتێکدا هەیە هیچ شتێك ناتوانێت لەژێردەستی دەربچێت .

(٣٠) باس بکە بۆیان رۆژێك کە هەمو کەس هەرچی کردوە لە چاکە بۆی ئامادە دەکرێت هەروەها ئەوەش کە کردویەتی لە خراپە دیسان ئەویشی بۆ ئامادە دەکرێتو ئاوات دەخوازێتو دەلێت خۆزگە لە نێوان منو تاوانەکانمدا ماوەیەکی درێژ بوایە کە نەگەیشتینایە بە یەك، بەلێ تاوانباران ئالەو کاتەدا پەشیمان

دەبنەوە کەهیچ سودی نیە بۆیان، وە خوای گەورە لە خۆیتان دەترسێنێت. جا بۆ دەتان ترسێنێت؟ چونکە میهرەبانە بە بەندەکانیو پێی خۆش نیە کە بەندەکانی لەناکاودا یەخەیان بگیرێتو توشی ئێشو ئازار ببن.

(٣١) ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت ساپەیرەوی من بکەن خوای گەورەش ئێوەی خۆش دەوێتو لە تاوانتان خۆش دەبێت، بە راستی خوا خوایەکی لێبوردەو بە سۆزە بەرامبەر بە بەندەکانی خۆیو لە تاوانەکانیان خۆش دەبێت. واتە کاتێ دەتوانین ئێمە خۆشەویستی خوا بۆ خۆمان رابکێشین کە پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ بینو فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەین ئەگینا قسەی پووچی بێ ناوەڕۆك هیچ سوودێکمان پێ ناداتو نابین بە دۆستی خوا.

(٣٢) پێیان بڵێ: پەیرەوی فەرمانەکانی خواو ئەم پێغەمبەرەیﷺ بکەن ئەوسا ئەگەر ئەوان پشتیان کردە تۆ و بە گوێی تۆیان نەکرد ئیتر با بزانن کە ئەوان کافرن وبێگومان کە خوای گەورەش کافرانی خۆش ناوێت.

لە پاش ئەوەی کە لە ئایەتەکانی پێشوودا بە زەقی خوا باسی دەسەڵاتو هێزی خۆی کردو هەڕەشەی کرد لەو کەسانەی کە غەیری خوا ئەکەن بە دۆست بۆ خۆیان، ئینجا بە شێوەی داستان دووبارە ئەم هێزو دەسەڵاتە گەورەو بێ سنورەی خۆیمان بۆ باس دەکات دەفەرموێ:

(٣٣) بێگومان کە الله لەناو تەواوی مرۆڤی جیهاندا ئادەمو نوحو ئالی ئیبراهیمو ئالی عیمرانی هەڵبژاردووەوڕێزی زیاتری پێداون.

(٣٤) ئەمانە هەندێکیان لە هەندێکیانن‌و چوون بەناو یەکداو سەر بەیەکن، وە بەراستی خوای گەورە بیسەری گوفتارو زانەری ئیشەکانتانە. نوحو ئەوەی پاش نوح هەموی لە ئادەمن، وە ئیبراهیم لە نوحە چونکە پاش نوح خەڵك هەموی لە سامو حامو یافیسن کە کوڕی نوحن ئیبراهیم نەوەی ئەوانەو پێغەمبەرانی پاش ئیبراهیم هەمویان لە ئیبراهیمن‌و ئالی عیمرانیش هەر نەوەی ئیبراهیمە مەبەست لە ئالی عیمران باپیری مەریەمی دایکی عیسایە.

(٣٥) باس بکە ئەی محمدﷺ ئەو کاتەی کەوا ژنی عیمران حاملە بوو وتی: خوایە ئەو منداڵەی کە لە ناو سکم دایە وا نەزرم کرد بۆ تۆ کە لە هەمو ئیشو ئەرکێك ئازادی بێت تاکو خزمەتی ماڵی تۆ کە (بیت المقدسە) بکات، سا خوایە لێم وەربگرە بە بێگومان کە تۆخۆت بیسەری بۆئەو پاڕانەوەمو زانەری بەو مەبەستەی کە لەدڵمدایە. دەڵێن: خێزانی عیمران منداڵی نەبو لە پاش ماوەیەکی زۆر خوای گەورە ئەم سکەی پێدا، ئەویش بەڵێنی دا کە ئەو سکەی بو، کە بە خەیاڵی خۆی کوڕە، بیکات بە خزمەتچی ماڵی خواو ئازاد بێتو هەر بۆ خوا ئیش بکاتو داوای کرد کەخوا ئەمەی لێ قەبوڵ بکات.

(٣٦) جا کاتێ کە سکەکەی بو کچ بو وتی: ئەی پەروەردگارم کچم بووە خوای گەورە زاناترە بەوەی کە بویەتی کچەو هەرگیز نێرینە وەك مێینە نیە بۆ خزمەتکردن، وە بە بێگومان کەمن ناوم نا مەریەم، وەئەی خوایە پەنا دەگرم بە تۆ بۆ ئەم کچەم کە بیپارێزیو هەروەها نەوەی ئەم کچەش بپارێزی لە شەیتانێ کە تۆ نەفرینت لێکردوەو دورت کردوەتەوە لە رەحمەتی خۆت. لە فەرمودەی پێغەمبەرﷺ دا هاتوە کەدەفەرموێ:{مَا مِنْ بَنِي آدَمَ مَوْلُودٌ إلا يَمَسهُ الشيْطَانُ حِـ يُولدُ فيَسْتَهل صَارِخًا مِنْ مَس الشيْطَان غَيْرَ مَرْيَمَ وَابْنِهَا ثم يَقُولُ أبو هُرَيْرَةَ وَإني أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِيَتَهَا مِنْ الشيْطَان الرجيم/ متفق عليه / هەر کەسێ کە لە دایك ببێت شەیتان بۆکزی خۆی لێ دەدات جا گورج هەرلەدایك دەبێت دەگری بێجگە لە مەریەمو کوڕەکەی بە بۆنەی ئەو دوعایەی کە دایکی مەریەم کردی}پاشان ئەبو هورەیرە دەڵێ:مەبەست لەو دوعا ئەمەیە:

﴿وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴾ آل عمران: ٣٦

جا ئەم ئایەتە دەمکوتێکی ترە بۆ ئەوانەی کە داوای یەکسانی ئافرەتو پیاو دەکەن لە ئیشو کارداو دەڵێن: دەبێ لە بەینی ژنو پیاودا مساوات هەبێ. ئەڵبەتە لە ئیسلامدا لە ئیش کردنو لە بەهرەی ئیشەکە فەرقی پیاوو ژن نیەو هەر کەسێك ئیش بکات بۆ خوا وە هەرچەندێك ئیش بکات چ پیاو بێت چ ئافرەت پاداشەکەی لە لای خوا بە بێ کەمو زیاد دەدرێتەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ من کردەوەی هیچ کەس هەڵناوەشێنمەوە نێر بێت یان مێ﴾ ال عمران/ ١٩٥،

بەڵام لە مەسەلەی ئیش کردنی دنیادا کە هەر کەسێك بۆ ئیشێك دانراوە. ئافرەت بۆ خزمەتی ناو ماڵو پیاو بۆ خزمەتی دەرەوە دروست کراوە ئەوەتە ئافرەتان حەملیان دەبێت و منداڵ هەڵدەگرن کەئەمە لەگەل کاروباری دەرەوەی ماڵدا سەختو نەگونجاوە، بەڵام ئەو شتە لەپیاودا نیە، واتە دوو هەیکەلن‌و جیان لە یەكو لە ساختمانی لەشیاندا وەکو یەك نین جائیسلام دادپەروەرەو ئەوئەرکەی کە دایناوە بۆ ئافرەت شیاوی خۆیەتی بۆنمونە ئافرەت حەوسەڵەو دانایی تێیدایەو بۆ راپەڕاندنی کارەکانی ناوماڵ ئەوەی بەو دەکرێت لەو بوارەدا بەئاسانی بەپیاو ناکرێتو لەبواری پەروەردەییو مامۆستایو کرێکاریدا نیوەی ئەرکی کۆمەڵگای لەسەرشانەو لێزانترە لەپیاو لەرێكو پێك کردنی ئیشە کانی ناو ماڵداو ئاسان ترە لەلای، ئیشی دەرەوەشی

هُنَالِكَ دَعَا زَكَرِيَّا رَبَّهُۥۖ قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةًۖ إِنَّكَ سَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٨﴾ فَنَادَتۡهُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُوَ قَآئِمٞ يُصَلِّي فِي ٱلۡمِحۡرَابِ أَنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكَ بِيَحۡيَىٰ مُصَدِّقَۢا بِكَلِمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَسَيِّدٗا وَحَصُورٗا وَنَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٣٩﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَقَدۡ بَلَغَنِيَ ٱلۡكِبَرُ وَٱمۡرَأَتِي عَاقِرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ﴿٤٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ إِلَّا رَمۡزٗاۗ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ كَثِيرٗا وَسَبِّحۡ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٤١﴾ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۚ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يُلۡقُونَ أَقۡلَٰمَهُمۡ أَيُّهُمۡ يَكۡفُلُ مَرۡيَمَ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ يَخۡتَصِمُونَ ﴿٤٤﴾ إِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ ٱسۡمُهُ ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ وَجِيهٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٤٥﴾

بۆ پیاو داناوەچونکە ساختمانی لەشی پیاو گونجاوترە بۆئیشە سەختەکانی دەرەوە. ئەمەکەمیو نوقسانی هیچ لایەکیان ناگەیەنێت بەڵکو ئەمە دادپەروەرییەو سپاردنی ئەرکە بەپسپۆڕولێزانی ئەو ئەرکە ئاشکرایشە کە بەوشێوەیە کۆمەڵگا ئاسودە تروکەمترین گێرەوکێشە دەبێت، وە لەبواری خۆشەویستی ناوخێزاندا بەهیچ شتێك جێگای دایك پڕ ناکرێتەوە جا ئەگەر دایك لە ماڵ دەرهێنراو برایە ناو کارخانەو سەربازگەکانەوە ئیتر ئەوخۆشەویستیە نامێنێو کۆمەڵگاش کۆمەڵگایەکی بێ رەوشتی بێ بەزەیی وەك ئەمڕۆی لێ دێت، کوردواتەنی"ئەم هەویرە ئاوی زۆری دەوێ" لێرەدا بەم پرسیارە کۆتای دێنین: ئایا ژییرانەیە گڵابە بهێنی بۆ نەفەرگواستنەوەو بەپاسیش بلۆك ئازوگویاز بکەیت؟

﴿٣٧﴾ جا پەروەردگاریشی نزاکەی وەرگرت وزۆر بە جوانی پێیگەیاندو سەوزی کرد بۆی بە سەوز کردنێکی جوان جا بو بە ئافرەتێکی بەرێزو پایە بەرز، بەڵێ: گوڵێك بێتو خوا خۆی سەرپەرستی سەوز بوونو نەخشو نیگاری بکات دەبێ هەرئاوابێت. جا یان بە بۆنەی ئەوەوە کە باوکی نەمابوو یان ساڵە گرانی بو، بۆ ئەوەی زاناترو کاری جوانتر شارەزا ببێت پەروەردگار وای کرد کە زەکەریا کەمێردی پوری مەریەم بو سەرپەرستی بکات جاهەرکاتێك کە زەکەریا دەچو بۆ سەردانی مەریەم لەمیحرابدا، دەی دی کە بژێوییەکی وای لەلا یە کە ئەوروزی‌و بژێوییە لەو شوێنو سەردەمانەدا پەیدا نابێت لە زستان دا رۆزی هاوینەی لەلا بو لە هاوینیش دا رۆزی زستانەی لەلابو بۆیە زەکەریا لەو رووداوە گرنگە سەری سوڕماو وتی: مەریەم ئەو رۆزیەت لە کوێ هێناوە؟ وتی: ئەمە لە لایەنی خواوە هاتوە بە راستی خوا رۆزی دەدات بەو کەسانەی کە ئارەزۆی لێ بێت بە بێ ژمارە، ئینجا زەکەریا کە ئەم شتە گرنگەی دی کە رۆزییەکی ئاوەها نایاب بۆ ئافرەتێك کە هاتو چۆی دەرەوە ناکات!! دڵی هاتە جۆشو بەزەیی بە بێ منداڵی خۆیدا هاتەوەو بە چاوی خۆیشی دی کە هیچ شت لە لای خوا سەخت نیە هەر بۆیە بە دڵێکی پڕ هیواو ئۆمێدەوە هاواری کردە لای خواو داوای کوڕی لێ کرد وەك لێرەدا دەفەرموێ:

﴿٣٨﴾ئا لێرەدا زەکەریا داوای لە پەروەردگاری کرد کە وتی: خوایە لە بار خانەی خۆت ئەولادێکی پاك‌و خاوێنم پێ بدە بە بێگومان کە تۆ بیسەری ئەم نزایەی منی. بەڵێ ئەم نزاو دوعایە وەرگیرا وەك دەفەرموێ:

﴿٣٩﴾ جالەحالێکدا کەبەپێوە وەستابو لەمیحرابەکەیداو نوێژی دەکرد فریشتەکان بانگیان کردو وتیان: بەبێشك کە خوا مژدەت پێ دەدات بە کوڕێك کە ناوی یەحیایە کە لەو سەردەمەدا ئاوەها ناوێك نەبوە کە دان دەنێت بەراستی ئەو وشەیەی کەلەلایەنی خوداوەیە کە عیسایە، وە گەورەیەو مەنع کراوە لە ئیشی خراپەو لە ژن هێنان، هەندێك دەڵێن ژنی نەهێناوە، وەپێغەمبەرێك دەبێ لەریزی پیاوچاکان. ئا بەم شێوەیە خوای گەورە وەڵامی زەکەریای دایەوە.

﴿٤٠﴾ ئینجا زەکەریا وتی: ئەی پەروەردگارم من چۆن منالّم دەبێت بەراستی پیر بووم‌و تەمەنێکی زۆرم کردووە ژنەکەشم نەزۆکەو ئەوە چەند ساڵە منالّی نەبوە؟! خوا فەرموی: ئاوەهایە خوای تۆ هەرچی مەیلی لێ بێت دەی کات. کەس ناتوانێت دەستی بگرێت، ئیتر زەکەریا یەقینی پەیدا کرد کە ئەو منالّەیان دەبێت، بەڵام نەیدەزانی کەی کاتی پەیدا بوونی ئەو منالّە دەست پێ دەکاتو پێی خۆش بو کەکاتی دەست پێ کردنی بزانێت بۆیە:

﴿٤١﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم پیشان بدە بۆ ئەوەی کە دڵنیا بم بە کاتی پەیدا بوونەکەی فەرموی: نیشانەی زانینی پەیدا بوونی ئەو منالّە بۆ تۆ ئەوەیە کە تۆ ناتوانیت سێ رۆژ قسە بکەیت. وە لە سورەتی مەریەم دا دەفەرموێ: سێ شەو، کەواتە: سێ شەو سێ رۆژ زەکەریا زمانی بەستراو و قسەی پێ نەکراوە تەنها بە شێوەی ئیشارەت نەبێت ئەمەش لە کاتی ساغ‌و سەلامەتی دابو کەزمانی رێك‌و پێك‌و دەیتوانیْ یادی خوای پێ بکات، بەڵام نەیدەتوانی قسەی تری پێ بکات. وە دەفەرموێ: زۆر

یادی خوای خۆت بکە بە ئێواران‌و بە بەیانیان‌و تەسبیحاتی خوای خۆت بکە.

تێبینی: لێرەدا ئەمانە وەرئەگرین:

یەکەم - باوەڕبون بە توانایی‌و هێزی لە سنور بە دەری خوای داناو زانا، ئەوەتە میوەی پەیدا نەبوی ئەو کاتە دەدات بە مەریەم لە ژووری مزگەوتی قودس دا چۆن‌و لە کوێی هێنا هەرالله خۆی دەزانێت بە راستی ئەوەندە ئیشێکی گرنگە پێغەمبەرێکی وەك زەکەریا سەری سووڕ دەمێنێ بۆیە پرسیار دەکات‌و دەڵێت: ﴿ ئەی مەریەم ئەمەت لەکوێ هێناوە؟!﴾.

دووەهەم - جیاوازی ئافرەت‌و پیاو لە یەك‌و هەر کەس ئیدیعای یەکسانیان بکات لە هەمو رویەکەوە، تاوانبارەو قسەکەی دژی فەرموودەی خوایە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰ /آل عمران: ٣٦/ نێرو مێ وەکویەك نین ﴾

سێهەم - ئافرەت‌و پیاو یەکسانن لە پەرستنی خوداو لە پاداشتی لای خواو هەردوو دروسکراوی خودان‌و جیاوازی ناکات لە نێوانیاندا هەر کامیان باشتر عیبادەتی خودا بکەن خۆشەویسترن لای خودا ئەوتا لێرەدا مەریەم ئافرەتێکە چونکە بە راستی خوای خۆی دەپەرستی خوای گەورە ئاوەها پاداشتی داوەتەوە کە پیاوێکی وەکو زەکەریا کە پێغەمبەریشە سەری سووڕ دەمێنێت وەکو هەر لە کۆتایی ئەم سورەتەدا دەفەرموێ: ﴿ بەبێگومان من کرداری هیچ باوەڕدارێك زایەناکەم نێربێ یان مێ﴾

چوارەم - موسڵمان نابێت نا ئومید ببێت لە رەحمەت‌و سۆزی خودا ئەوەتە زەکەریا لەو تەمەنە پیرەی خۆی‌و نەزۆکی خێزانی هاواری کردە لای خوا بۆ مناڵێکی پایە بەرزو پێغەمبەرو پیاو چاك خودایش نزاکەی لێ وەرگرت‌و یەحیای پێ دا.

پێنجەم - هەر کاتێ ئینسان چاوی کەوت بە شتێکی سەر سووڕ هێنەر با لەو کاتەدا دوعای چاك بکات ئەوە کاتێکە لەو کاتانەی کە دوعا وەردەگیرێت.

شەشەم - موسڵمان دەبێت دوعاکانی بۆ شتی باش بێت نەك بۆ دژایەتی‌و خراپە کاری‌و دنیا پەرستی بێت ئەوەتە لێرەدا زەکەریا دەڵێت: ﴿قَالَ رَبِّ هَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ ذُرِّيَّةٗ طَيِّبَةً ﴾ آل عمران: ٣٨/ ئەی پەروەردگارم مناڵێکی پاك‌وخاوێنم پێ بدە﴾ بەڵێ خوای گەورە ئەو جۆرە دوعایەی پێ خۆشە بۆیە لە سورەتی بەقەرەدا هەڕەشەی لە نزای دنیایی کردووەو مژدەی دا بەو کەسانەی کە داوای چاکەی دنیاو قیامەت دەکەن تەماشای ئایەتی (٢٠٠-٢٠٢) بەقەرە، بکە.

دووبارە باسەکە روو دەکاتەوە مەریەم ودەفەرموێ:

(٤٢) وەئەی محمدﷺ باس بکە ئەو کاتەی کە فریشتەکان وتیان: ئەی مەریەم بەبێگومان کەالله تۆی هەڵبژاردووەو بەرزی کردویتەوە بە سەر تەواوی ژنانی سەردەمی خۆتدا. واتە لەو سەردەمەدا لە مەریەم بەرزترو بە قیمەتتر نەبوە لە ناو ژنان دا پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: {خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ / منفق عليه/ باشترین ئافرەتی ئەو گەلەی سەردەمی مەریەم، مەریەمی کچی عیمران بوە، وە باشترین ئافرەتی ئەم ئۆمەتەیش خەدیجەی کچی خویلیدە}

(٤٣) ئەی مەریەم گەردن کەچبە بۆ خوای خۆت‌و سوجدەی بۆ ببەو رکوع ببە لە کەل ئەوکەسانەی کە رکوع دەبەن. ئەمەش لە رواڵەتدا ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کاتە رەوا بوبێت هەڵس‌وکەوتی ئافرەت‌و پیاو بە یەکەوە بۆ ئەنجام دانی عیبادەت هەروەکو ئێستا لە حەجدا رەوایەو ئافرەتان نابێ رێگای جومعەو جەماعەتیان لێ بگیرێت هەر چەند بەندایەتی ناو ماڵی خۆیان خێری زیاترە لە بەر ئەو فەرمودەیە کە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ لَا تَمْنَعُوا نِسَاءَكُمْ الْمَسَاجِدَ وَبُيُوتُهُنَّ خَيْرٌ لَهُنَّ / ابوداودۀ و وصححه الالبا / رێگری ئافرەتەکانتان مەکەن بۆمزگەوتەکان، خۆ ماڵەکەیان باشترە بۆیان}

لە ژنان خەدیجە لە هەمویان گەورەترە ئینجا مەریەم ئینجا ئاسیە کە خێزانی فیرعەون بو پاشان فاتمەی خێزانی علی کە کچی پێغەمبەرە ﷺپاشان عائیشەی خێزانی وە ئەمانە لەم فەرمودانەدا هاتوون:

یەکەم: لەپێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەفەرموێ:{حَسْبُكَ مِنْ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ مَرْيَمُ ابْنَةُ عِمْرَانَ وَخَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ وَفَاطِمَةُ بِنْتُ مُحَمَّدٍ وَآسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ /الترمذي، صححه الالبا / لە هەمو ئافرەتانی دنیا بۆ چاکەکاری بەسە بۆت کە ئەمانە بناسی: مەریەمی کچی عیمران‌و خەدیجەی کچی خوەیلیدو فاتیمەی کچی محمدو ئاسەیەی ژنی فیرعەون}

دووەهەم - هەروەها عائیشەی خێزانی پێغەمبەرﷺ یەکێکە لەو ئافرەتە بەرێزو پایە بەرزانە وەك لەم فەرمودەیەدا هاتوە کە{كَمَلَ مِنْ الرِّجَالِ كَثِيرٌ وَلَمْ يَكْمُلْ مِنْ النِّسَاءِ إِلَّا آسِيَةُ امْرَأَةُ فِرْعَوْنَ وَمَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ وَإِنَّ فَضْلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّسَاءِ كَفَضْلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَائِرِ الطَّعَامِ /البخاري/ لە پیاوان زۆر کەس پیاوی تەواو بوون بەڵام لە ئافرەتان تەواو نەبوون بێجگە لە ئاسیەی خێزانی فیرعەون‌و مەریەمی کچی عیمران، وە بە راستی گەورەیی عایشە بە سەر ژنان دا وەکو گەورەی تێکوشینی گۆشتاوە بەسەر باقی خواردنەکانی تردا}

وشەی (قنوت) واتە گوێ رایەڵی‌و پەیڕەو کردن بۆ ئەم مانایەش هەندێ لە زانایان فەرمودەیەکیان کردوە بە بەڵگە کە دەفەرموێ:{كُل حَرْفٍ مِنْ الْقُرْآن يُذْكَرُ فِيهِ الْقُنوتُ فَهُوَ الطاعَةُ /رواه أ د/ هەر پیتێك لە قورئان دا باسی قنوتی تێدا بێت بە مانای گوێ رایەڵی‌و پەیڕەوی کردنە} بەڵام ئەم فەرمودەیە لاوازەوجێگای متمانە نییە.

(٤٤) ئەمەی کە باسمان کرد ئەی محمد ﷺ هەموی خەبەرانی نهێنی بوون‌و چەندین ساڵ پێش تۆ ئەو شتانە رویداوە کە ئێمە نیگامان رەوانە کرد بۆ تۆو بۆمان باس کردیت‌و لەو کاتەی کە ئەوان قەڵەمەکانیان فڕێ دا بۆ ئەوەی بزانن کامیان سەرپەرستی مەریەم بکەن تۆڵەلای ئەوان نەبویت‌و تۆڵەلایان نەبویت ئەوکاتەی کەکێشەیانبوو لەسەر سەرپەرشتی کردنی مەریەم. ئیتر ئەمە لە بەر بێ باوکی مەریەم بو یان کەم دەسەڵاتی باوکی بووە باوکیشی پێشەوای ئەو سەردەمەی ئەوان بوە لە بەر ئەوە ئەو خەڵکە حەزیان دەکرد کەسەرپەرەشتی ئەو مناڵە بگرنە ئەستۆی خۆیان، وە لە ناو ئەوان دا هەیە دەڵێن کەخێزانی زەکەریا پووری مەریەم بو یان خوشکی بو حەزی دەکرد لای ئەو بێت زەکەریاش پێغەمبەری خوا بو، بەڵام چونکە خەڵکێکی زۆر داوای لێ دەکرد کە بە خێوی بکات هەستان چەند قەڵەمێکیان فڕەدایە ناو ئاوێك‌و وتیان قەڵەمی کێ وەستاوە ئەوە با بەخێوی بکات، ئینجا کە قەڵەمەکانیان فڕێ دا هەمویان ئاو بردنی تەنها قەڵەمی زەکەریا ماوە کە بەرەو ژور لە ئاوەکە هاتەوە بەو شێوەیە خوای گەورە ویستی ئەو ئافرەتە لە لای ئەو پێغەمبەرە بەرێزە بەخێو بکرێت.

(٤٥) ئینجا خوای گەورە درێژە بەم چیرۆکە بەڕێزە دەدات‌و دەفەرموێ: بیر بکەرەوەو باس بکە بۆیان ئەی محمد ﷺ ئەو کاتەی کە فریشتەکان بەمەریەمیان وت: بە راستی خوا موژدەت پێ دەدات بە وشەیەك‌و بە بڕیارێك لە لایەنی خۆی کە ئەو بڕیارەش دروستبوونی مرۆڤێکە بەناوی مەسیح کەعیسای کوڕی مەریەمەو پیاوێکی ناودارەو بە شەرەفە لە دنیاو لە دوا رۆژداو لە بەندە نزیکەکانی خوایە. بەم شێوەیە موژدە درا بە مەریەم کە عیسای دەبێت، کە هێشتا مێردی نەکردوە عیسا عليه السلام لە زۆر شوێن دا بە کەلیمەی خوا ناوبراوەو کەلیمەی خوایش زۆرە، بەڵام چونکە عیسا بە بێ هۆی باوك پەیدا بووە تەنها بە بڕیارێکی خوا لە بەر ئەوە بە کەلیمەی خوا ناودەبرێت. بەڵێ خوا دەفەرموێ:

(٤٦) لە بێشکەدا قسە دەکات لە گەل خەڵکداو دەڵێ من پێغەمبەری خودام و کاتێ کە دەبێ بە پیاوێکی تەواویش هەمان قسەدەکات‌و یەکێکە لە پیاو چاکان، ئاشکرایە قسەی کاتی

وَيُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗا وَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَتۡ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي وَلَدٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞۖ قَالَ كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمۡرٗا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٧﴾ وَيُعَلِّمُهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴿٤٨﴾ وَرَسُولًا إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنِّي قَدۡ جِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ أَنِّيٓ أَخۡلُقُ لَكُم مِّنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ فَأَنفُخُ فِيهِ فَيَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ وَأُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۖ وَأُنَبِّئُكُم بِمَا تَأۡكُلُونَ وَمَا تَدَّخِرُونَ فِي بُيُوتِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٤٩﴾ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَلِأُحِلَّ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي حُرِّمَ عَلَيۡكُمۡۚ وَجِئۡتُكُم بِـَٔايَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٥١﴾ ۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ﴿٥٢﴾

گەورەیی شتێکی گرنگ نیە مەبەست قسەی رووت نیە بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەر وەکو لە بێشکەدا دەڵێت من پێغەمبەرم کاتێ کەگەورە بو قسەکەی بە راست دەگەڕێت‌و دەبێ بە پێغەمبەروهەمان پەیامی ناوبێشکەی رادەگەیەنێت ، جا باشە کەئەمەش بزانیت کە سێ کەس بە مناڵی قسەیان کردەوە، یەکێکیان، عیسا عليه السلام بو وەکو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لە بێشکەدا قسەی نەکردوە بێجگە لە سێ کەس عیساو مناڵێك لە زەمانی جورەیجداو مناڵێکی تر}

وە بە عیسا عليه السلام دەوترێت مەسیح لە بەر یەکێك یان هەمو ئەم شتانە **یەکەم**: لە بەر ئەوەی زۆر دەگەڕا. **دووهەم**: پاژنەی نەبووەو ژێر پێی ساف بووە. **سێهەم**: دەستی بە سەر هەر جۆرە نەخۆشێك دا بهێنایە بەئیزنی خودا چاك دەبویەوە.

(٤٧) جا مەریەم کاتێ کەئەم قسانەی بیست وتی: ئەی پەروەردگارم من چۆن منداڵم دەبێت ئەمە شتێکی سەر سووڕهێنەرە چونکە هیچ کەسێك نە بە حەرامی‌و نە بە حەڵاڵی جیماعی لە گەل مندا نەکردوە و بە تەمای ئەوەش نیم کە مێرد بکەم، چونکە من خزمەتیماڵی تۆ دەکەم؟! فەرموی: هەر ئاوەها خوای تۆ دروست دەکات ئەو شتەی کە ئارەزۆی لێ بێت. ئەگەر بە وردی تەماشای ئەم داستانە بکەین دەبینین لە بارەی زەکەریا دا خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿كَذَٰلِكَ ٱللَّهُ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ /آل عمران: ٤٠/ هەر ئاوەها خوا دەیکات ئەوەی کە ئارەزۆی لێ بێت﴾ بەڵام

لە داستانی مەریەم دا دەفەرمویٚ: ﴿كَذَٰلِكِ ٱللَّهُ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ﴾ آل عمران: ٤٧/ هەرئاواها خوا هەرچی ئارەزۆبكات دروستی دەكات﴾ لێرەدا خەلقی فەرموە، چونكە لەویٚ كردارەو پیاو ژن مەعقولە منالّیان ببێت، با لەو پەڕی پیریشدا بن، بەلاّم مەریەم مێردی نیە. ئیتر دەبێت دروستبونەكەی هەر لە خواوە بێتو دەمكوتێكیشە بۆ زمان پیسان سەبارەت بە عیساو مەریەمی دایكی، وە تا جێگەی گومان نەمێنێتەوە كە دروستكردنەكە هەر بە دەست خۆیەتیو راستەوخۆخۆی دروستی كردوە ئەوەتە دەفەرمویٚ: هەر كاتێك خوای گەورە ئیرادەی هەر شتێك بكات هەر كە فەرموی: ببە دەبێت. ئیتر بۆچی دەبێت خەلّك ئەم ئیشەی مەریەم بە تاوان بزانێت لە گەل بونی ئەوبەلّگە گەورەیە كە قسە كردنی ئەو منالّە ساوایە بوو؟!

(٤٨) وە خوای گەورە فێری نوسینو دانایی‌و تەوراتو ئینجیلی كرد، تەورات بۆ موسا بووە، عیسا یش لە سەری رۆیشتووە پاشان ئینجیلی وەك تەواوكەرێكی تەورات بۆ هاتوە.

(٤٩) وە پێغەمبەرێك بوە بۆ بەنی ئیسرائیل، جا ئیتر لێرە بە دواوە شێوەی قسەكە دەگۆڕێت لە غایبەوە بۆ قسەكەر، بەلیٚ وا ئەو منالّە پەیدا بوو گەورەش كرا، بو بە پێغەمبەرو ئەویش دەستی كرد بە ئەنجامدانی ئەركەكانی سەرشانی‌و هێنانی بەلّگەی راستو دروست لەسەر پێغەمبەرایەتی خۆی‌و وتی: بە بێگومان من هاتووم بۆ لای ئێوە ئەی گەلەكەم بە بەلّگەیەك لە لایەنی خواوە كەمن لە قوڕ لە شێوەی باڵندە دروست دەكەم بۆتان جافوی پێدا دەكەم بە ئیزنی خوا دەبێت بە باڵندەو دەفڕیٚ، هەروەها ئەوەی كە لەسەرەتاوە كوێربووەو ئەوكەسەش كە بەلّەك بێت باشیان دەكەمەوەو مردوویش بە ئیزنی خوا زیندوی دەكەمەوە، وەپێتان دەلّێم ئەوەی كەلەمالّەوە دەیخۆنو ئەوەش كە هەلیٚ دەگرن بەبێگومان ئالەوەدا نیشانەیەكی گەورە هەیەبۆتان ئەگەر ئێوە باوەڕدار بن.

(٥٠) وە من دان دەنێم بەوەی كە لە پێش دەستم دایە كە تەوراتەو بە راستی دەزانم، وە هاتوم تا حەلاّلْ بكەم بۆ ئێوە، هەندێك لەوانەی كە حەرام كراوە لێتان. ئەمە وا دەردەخات كە ئینجیل هەندێك حوكمی تێدا بوە بۆ بۆ هەلّوەشاندنەوەی هەندێك لە حوكمەكانی تەورات هەندێكی تر دەلّێن ئەوان هەندیٚ شتیان لە خۆیان حەرام كردبوو ئینجیل هاتو بە درۆی خستنەوەو پێی وتن: كە ئەو شتانە حەلاّلْن. دیسان عیسا درێژە بەقسەكەی خۆی دەداتو دەلّیٚ: وە من لەلایەن پەروەردگارتانەوە بە بەلّگەیەكی گەورە هاتومەتەلاتان سا لە خوا بترسنو پەیڕەوی من بكەن. بۆ زانین: ئەونونانەی كە لە قورئاندا بە كردارەكانەوەنەوە (افعال) هاتون كە ژێریان هەیە هەمویان (یائی) قسە كەر یان لیٚ لابراوەو ئەو ژێرە لە باتی ئەودا دەنوسن وەك﴿وَأَطِيعُونِ﴾ لەپێشدا ﴿وَأَطِيعُونِ ی﴾ بوە.

(٥١) بە بێگومان كە خوای گەورە پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەشە دەسا بی پەرەستن ئەمەیە رێگای راست. ئا بەم شێوەیە عیسا بانگی گەلەكەی خۆی دەكردو سوور بو لە سەر رێگای خێر پێشان دانیان، بەلاّم ئەوان تا دەهات زیاتر دورە پەرێز دەبونو دژایەتی عیسایان دەكرد.

(٥٢) جا كاتیٚ كە عیسا هەستی بیٚ باوەڕی لیٚ كردن چارەی نەماو ناچار بۆ جیا كردنەوەی‌راستو ناراست وتی: كیٚ هەیە یارمەتی من بدات بۆگەیاندنی پەیامی ﷲ؟ خودا لێرەدا ئەوەمان پێشان دەدات كە پێشەكی خاوەن باوەڕان پێویستە لە سەریان كە بانگەوازەكەیان بە ئاشكراو گشتی بێت جا ئەگەر زانی بە گوێی ناكرێت ئیتر واز لە گشتی بهێنێتو خاوەن باوەڕی راست جیا بكاتەوە بۆ گەیاندنی ئاینەكەی خودا، نەك هەمیشە هەر بە یەك جۆر رەفتار بكات لە گەل ئەوەشدا دەزانێت كە تا ئێستا ئەو شێوەیە هیچ سودێكی نەداوە بۆ راستی بۆ چونەكەمان فەرموو ئێوە ئەم بەلگەیە، پێغەمبەرمانﷺ لە كاتی حەج دا پێش ئەوەی كۆچ بكات بۆ مەدینە دەیفەرمو:{أَلَا رَجُلٌ يَحْمِلُنِي إِلَى قَوْمِهِ فَإِنَّ قُرَيْشًا قَدْ مَنَعُونِي أَنْ أُبَلِّغَ كَلَامَ رَبِّي؟/ ا دوء ه صحح الالبا / واتە چ پیاوێك من دەبات بۆ ناو گەلەكەی‌و یارمەتیم دەدات تا فەرمودەكانی پەروەردگارم بگەینم بە خەلّك؟ بە راستی قورەیش لێم ناگەرێن تا فەرمودەكانی پەروەردگاری خۆم رابگەیەنم} بەلیٚ بانگەواز كەرانی رێگای ئاشتی‌و بەختەوەری كە رێگای ئیسلامە دەبیٚ بە چەند شێوە ئیش بكەن تا بزانن بە كامیان ئیشەكانیان بە سود دەبێتو قسەو بڕیارەكانیان كاری گەر دەبێت. تەنها ئەوە پێویستە كە لە ئایین لانەداتو وەك ئەمرۆ بەرژەوەندی نەكات بە خوا بۆ خۆی‌و نەزانانە ملی خۆی‌و پەیڕەوانیشی بشكێنێتو لە باتی خواپەرستی بیانخاتە ناو لێلاّوی شیركو دنیا پەرستیەوە. وشەی (الی) هەندیٚ دەلّێن: بە مانای (مع) یە واتە لە گەل خوادا وە بە لای هەندێكی ترەوە (الی) بە مانای بەرەو ئایینی خوایە واتە كیٚ یارمەتیم دەدات بەرەو رزگاری ئایینی خودا كە ئەمەم بە لاوە نزیكترەو وامان مانا كردوە.

وشەی (حواری) بە مانای ئەوانەی كە لیباس سپی دەكەنەوەو بە مانای نێچیرەوانو بە مانای یارمەتی دەر مانا كراوە كە ئێمە سێهەمیانمان هەلّبژاردوە لە بەر ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر ﷺ كەدە فەرمویٚ:{إِنَّ لِكُلِّ نَبِيٍّ حَوَارِيًّا وَإِنَّ حَوَارِيَّ الزُّبَيْرُ بْنُ الْعَوَامِ

**وَزَادَ أَبُو نُعَيمٍ فِيهِ يَوْمَ الْأَحْزَابِ قَالَ مَنْ يَأْتِينَا بِخَبَرِ الْقَوْمِ قَالَ الزُّبَيْرُ أَنَا قَالَهَا ثَلَاثًا قَالَ الزُّبَيْرُ أَنَا** /رواه ا د والترمذی واللفظ له/ هەر پێغەمبەرێك یارمەتی دەرێکی تایبەتی بوە یارمەتی دەری تایبەتی من زوبەیرە.ئەبونەعیم ئەمەی لێ زیادکردوە: ئەمە لەرۆژی ئەحزابدابوە کە فەرموی: کێ هەواڵێکی ئەوگەلەمان بۆدێنێ؟ مەبستی قورەیش بوو زوبەیر وتی: من. ئەمەی سێ جار فەرمو: زوبەیر وتی: من ئامادەم} جا حەوارییەکان وتیان: ئێمە لە گەل عیسادا یارمەتی ئایینی خوا دەدەین کەباوەڕمان هێناوە بە خوا، وە شایەتی بدە کە ئێمە موسڵمانین‌وخۆمان بەودەسپێرین. خوای گەورە داوا لە هەموو خاوەن باوەڕان دەکات کە هەمویان یارمەتی دەری ئایینی خودابن‌و دەفەرموێ: ﴿ئەی خاوەن باوەڕان ئێوەش ببن بە یارمەتی دەری ئایینی خودا وەکو چۆن عیسای کوری مریەم وتی بە قەومەکەی کێ یارمەتیم دەدات بۆ ئایینەکەی خوا حەوارییەکان وتیان: ئێمە یارمەتی ئایینی خودا دەدەین،جاتاقمێك لەبەنی ئیسرائیلی باوەڕیان هێناو تاقمێکیشیان کافربون ئەوسا ئێمەیش یارمەتی باوەڕدارانمان دا جا ئەوانیش سەر کەوتن بە سەر کۆمەڵی کافران دا﴾ سەف:١٤ جا ئێوەش ببن بەو کۆمەڵەو ببن بە یارمەتی دەری ئاینی خودا هەتا خۆاش ئێوە سەربخات.

(٥٣) ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوە بەوەی کە تۆ ڕەوانەت کردوەو دوای ئەم پێغەمبەرە کەوتووین دەی بمان نووسە لە ڕیزی ئەو کەسانەی کە شایەتن لە ڕۆژی قیامەتدا هەندێك دەڵێن ئەم شایەتیە مەبەست پێی ئوممەتی محمدﷺ واتە بمان نوسە لەو ئوممەتەی کە لە ئاخیر زەماندا دێتو دەبن بە شایەت لە سەر خەڵكو خوایە ئێمە لە ڕیزی ئەوان دا حیساب بکە. ئەمەش یەکێکی ترە لە سیفەتە جوانەکانی موسڵمانان، کابرا کاتێ کە دەعوەی ئایینی خودا دەکات هەرچەند کە عیبادەتیش دەکاتو ئیشی باش ئەنجام دەدات لە خۆبایی نابێت، بەڵکو لەو کاتەدا دەپارێتەوە لە خوا کە لێی وەربگرێت و بە پیاوێکی چاکی حیساب بکات. جائەم گەلە لاسارە هەر بە دژایەتی ئەو پێغەمبەرە وە نەوەستان بەڵکو چونە لای پاشای ئەو سەردەمەو قسەی زۆر خراپیان سەبارەت بە عیسا هەڵبەستو تەنانەت وتیان: ئەو باوكو کوڕی لە یەك جیا کردوەتەوەو خەڵکی سەر لێ شێواندوەو نایەڵێت لە سەر ڕێبازی باو باپیری خۆیان بڕۆنو پاشایان لە دژی ئەو پڕ کردو پاشایش فەرمانی دا کە بڕۆن بیگرنو هەڵیبەسن ئەوانیش چوونو چوار دەوری ماڵی عیسا یان گرتو وایان زانی بە ئاواتی خۆیان گەیشتون، بەڵام خوا عیسای ڕزگارکردو ئەوانی بۆهەمیشە شەرمەندەو ڕووڕەش کرد ئەگینا عیسا نەگیراوە نە هەڵواسراوە بەڵکو وەکو وتمان: خوا بەرزی کردەوەو لە دەستی

رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٣﴾ وَمَكَرُواْ وَمَكَرَ ٱللَّهُۖ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ ﴿٥٤﴾ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴿٥٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَأُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗا فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٥٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٧﴾ ذَٰلِكَ نَتۡلُوهُ عَلَيۡكَ مِنَ ٱلۡأٓيَٰتِ وَٱلذِّكۡرِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٥٨﴾ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٖ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٥٩﴾ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿٦٠﴾ فَمَنۡ حَآجَّكَ فِيهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ فَقُلۡ تَعَالَوۡاْ نَدۡعُ أَبۡنَآءَنَا وَأَبۡنَآءَكُمۡ وَنِسَآءَنَا وَنِسَآءَكُمۡ وَأَنفُسَنَا وَأَنفُسَكُمۡ ثُمَّ نَبۡتَهِلۡ فَنَجۡعَل لَّعۡنَتَ ٱللَّهِ عَلَى ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦١﴾

ئەوان ڕزگاری کرد وەك دەفەرموێ: ﴿نە کوشتیانو نە هەڵیان واسی بەڵام لێیان تێکدرا﴾ نیسا/ ١٥٧ بۆیە لێرەش دەفەرموێ:

(٥٤) ئەوان فڕوفێڵی خۆیانیان کردو خوا بە شێوەی فڕوفێڵەکەیان سەری لێ تێکدانو عیسای ڕزگار کرد. بە ڕاستی خوا چاکتر لە هەموو فێلبازان تۆڵە لە فێلبازان وەردەگرێت. ﴿وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلۡمَٰكِرِينَ﴾ یەکێکە لە سیفەتەکانی خواو نابێ (ماکر)ی ڕووت بە کار بهێنرێت. ئینجا خوای گەورە داوا لە پێغەمبەرمان دەکات کە باسەکەی عیسا زیاتر ڕۆشن بکاتەوە بۆمانو دەفەرموێ:

(٥٥) باس بکە بۆیان ئەو کاتەی کە خوا فەرموی: ئەی عیسا من نایەڵم دەستی ناپاکی ئەوان بە تۆ بگات، چونکە من تۆ ئەبەمەوەو بەرزت ئەکەمەوە بۆ لای خۆم. وشەی ﴿مُتَوَفِّيكَ﴾ بە مانای مردن هاتوە واتە ئەیمرێنم جا ئەمە هەندێك دەڵێن سێ ساعاتو هەندێك سێ ڕۆژ خوا مراندویەتی ئینجا زیندوی کردوەتەوەو بەرزی کردوەتەوە، هەندێك دەڵێن:پێشکەوتنو دوا کەوتن (**تقد و تأخ**) لێرەدا هەیە واتە ئێستا دەتبەینەوەو لە پاشدا دەتمرێنین، هەندێك دەڵێن بە مانای وەرگرتنەوەیە، کە ئێمە بەو شێوەیە لە پێشدا مانامان کرد. هەندێکی تر دەڵێن بە مانای خەوتنە، کە ئەمەش لە قورئاندا هاتوە وەکو لەئایەتی (٤٢) سورەتی زومەر وە ئایەتی (٦٠) سورەتی ئەنعام. وە خوا تۆی پاکوخاوێن کردوتەوە لە دەستی ئەوانەی کە بێ باوەڕ بون وە ئەو

کەسانەی کەبەراستی پەیڕەوی تۆن ئەی عیسا سەرکەوتوو دەبن بە سەر کافران دا هەتا کو ڕۆژی قیامەت. ئاشکرایە ئەو کەسەی کە باوەڕی بە عیسا بوبێتو بە پێغەمبەری زانیبێت لە پاشدا باوڕیان هێناوەو دەی هێنن بە پێغەمبەرمان ﷺ وە ئەم ئۆممەتەیش ئەگەر چی ناو بەناو لاوازو کەم دەسەلات ببێت بەلام هەتا قیامەت هەر دەمێنێتو سەریش دەکەوێت بە سەر دوژمنانی ئایندا، ئەم گەلە ئاخر گەلەو باوەڕ بون بەم پێغەمبەرە ﷺ باوەڕ بوونە بە تەواوی پێغەمبەران، بەڵێ بە ڕاستی ئەگەر چی ئێمە بە بۆنەی تاوانباری خۆمانەوە بێ دەسەلات بووین، بەلام دوژمنان هەر لێمان دەترسێن ساڵێك پاش کیمیابارانی هەڵبجە رادیو لەندەن شەوێك لە بەرنامەی فارسیدا وتی: ئەمەریکا هیچ ترسێکی لە رووس نەماوە، مەترسی تەنها لە موسڵمانە ئوسولیەکانە بە قسەی خۆیان ـ وتی دەبێ یارمەتی دەوڵەتەکانی خەلیج بدرێت بۆ لە ناو بردنی ئەو موسڵمانانە، ئەوەتە ئێستا دەبینین چۆن لەم وڵاتە بە ناو موسڵمانانەوە ڕۆژانە دەیان موسڵمانی ڕاست دەگیرێو شەهید دەکرێتو ئەمریکاو ئینگلیزیش ئەو هەموو سەربازو فرۆکەو کەشتیو چەکی جۆراوجۆرانەیان هێناوەتە سەر خاکی موسڵمانانو گاڵتە بە گیانو سامانیان دەکەن، ئێمە دڵنیاین کە جارێکی تر ئەوانە بە دەستی بەچکە شێرانی ئیسلام ڕاو دەنرێنو تۆڵەی دەست درێژی خۆیان وەردەگرنەوەو ئیسلام هەر سەرکەوتوو بە هێز دەبێت ئەگەر چی دوژمنان بە ملیاردها دولار دژی موسڵمانان خەرج بکەن.

ئەمەیە مانای﴿ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ ﴾ ئینجا خوای داناو زانا دەفەرموێ: لە پاشان بۆ لای من دەگەڕێنەوە ئینجا من حوکم ئەکەم لە نێوان ئێوەدا لە بارەی ئەو شتەوە کە ئێوە ناکۆکیتان تێیدا هەیە ئەوە بو هەندێك دەی وت: عیسا کوڕی خوایەو هەندێك دەیان وت: خوای سێهەمەو هەندێکیان عیسایان بە خوا دەزانیو هەندێکیش عیسایان بە بەندەی خواو پێغەمبەری خوا دەزانی کە ئەمەیان کۆمەڵە ڕاستەکەیان بو، جا خوا هەر وا ئەم پێغەمبەرانەی بە گاڵتە ڕەوانە نەکردوە بەڵکو ڕۆژی قیامەت بە گوێرەی هەڵوێستی خەڵك سەبارەت بەو پێغەمبەرانە خودا پاداش یان سزای ئەو خەڵکە دەدات وەك دەفەرموێ:

(٥٦) جا ئەوانەی کە بێ باوەڕ بوون ئەوسا ئێمەیش سزایان دەدەین بە سزایەکی زۆر سەخت هەم لە دنیاو هەم لە قیامەتیشدا، وەبۆ ئەوان هیچ یارمەتی دەرێك نیە کە یارمەتی ئەوان بداتو لەو سزایانە ڕزگاریان بکات. واتە بێ باوەڕان نە لەم ژیانەداو نە لەو ژیانەکەی تردا ناحەسێنەوە، ئەوەتە ئەمڕۆ بە بۆنەی داوێن پیسیەوە کەوتونەتە سزایەکی سەختی وا، کە خەریك گیانیان دەردەچێت، لەوانە نەخۆشی ئایدزە کە گیریان خواردوە پێویەوە. ئینجا توفان وباو بومەلەرزەو شەڕی دەرونیو بیرۆنیان با بوەستێت، خۆ سوتانو تێ هەڵدانو ئاوی داخ خواردنو خوێنو زوخاو خواردنەکەی قیامەتیشیان هەیە. ئینجا سەبارەت بە باوەڕداران دەفەرموێ:

(٥٧) وە ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە خوای گەورە پاداشتیان پێ دەداتەوەو بە ڕاستی خوا ستەمکارانی خۆش ناوێت.

(٥٨) ئا ئەوەی کە بۆ تۆی دە خوێنینەوە بەشێکە لە نیشانەکانی ئێمەو لەو قورئانە پڕ لە داناییەی کەپێمان داویت، واتە ئەوەی کە باسی دەکەین سەبارەت بە لە دایك بونی عیساو ژیانیو بەرز بونەوەی بۆ ئاسمان بەشێکن لەو بەلگە گەورانەی هێزودەسەلاتی خوداو بەشێکی ئەم قورئانە پڕ حیکمەتەن، ئینجا خوای گەورە سەبارەت بە دروست بوونی عیسا عليه السلام دەفەرموێ:

(٥٩) بە ڕاستی وێنەی دروستبونی عیسا لە لای خوا هەروەکو دروستبونی ئادەم وایە کە دروستی کردوە لە خاك نە بابی هەیەو نە دایك ئەویشی ئاوەها دروست کردوە بێ باوكو لە دایکێکی پاكو خاوێنو خوا ناس پاشان پێی فەرمو: ببە. ئینجا ئەویش بوو.

(٦٠) ئەوەی کە ڕاستبێ هەر ئەوەیە کە لە لای پەروەردگارتەوە هاتوە ئەوسا تۆ نەکەویتە گومانەوە لە م ڕوداوەی عیسادا. ئاشکرایە کەپێغەمبەری خوا ناکەوێتە گومانەوە، بەلام بۆ ئێمەیە ئەم ئاموژگارییە تا لاڕێ نەبین بەگومان بردنی خراپ.

(٦١) جا هەر کەسێك لەبارەی عیساوە پاش ئەوەی کە تۆ هەمو ڕاستیەکانت زانی دەمەقاڵەی لە گەلتا کرد، دەی پێیان بڵێ: وەرن با ئێمەوئێوە هەمومان کوڕانمانو ژنانمان بانگ بکەینوخۆیشمان لە پاشا هاوارەبکەینە لای خوا ئەوسا نەفرین بکەینو بڵێن: نەفرینی خوا لە درۆزنان. ئەمە لە کاتێکدا بو کە وەفدێکی فەلەکانی نەجران کە پێك هاتبو لە شەست سوار کە چواردەیان لە گەورە پیاوانو ئەشرافیان بوونو کارو باری ئەو ناوچەیە هەموی لە ژێر دەستی ئەوان دا بو لەوانە: عاقب کە ناوی عبد المسیح بوو ـوە سەید ـ کە ئەیهەم بوو ـو باوکی حاریسەی کوڕی عەلقەمە برای بەکری کوڕی وائیلو وەیسی حاریسو زەیدو قەیسو یەزیدو نەبیحو خوەیلیدو عەمرو خالیدو عەبدوڵاو یوحەننەش بوون ئەمانە بە ڕاستی پێغەمبەریان لە لا تەواو بو بەلام هەر بە دژایەتیو حەسادەتەوە دانیان بەم ڕاستیەدا نەدەناو

بەردەوام بون لە سەر ئایینە گۆڕاوەکەی خۆیان‌و دژایەتی پێغەمبەر ﷺ، ئینجا دەڵێن: سەرەتای ئالی عیمران هەتا ئایەتی هەشتا دەربارەی ئەوان دابەزیوەو ئەم نەفرینەی کە لێرەدا باسی دەکات ئەو کاتەبو کە لە هەمو قسەکاندا دژایەتیان کردو داوای چونیەتی دروستبونی عیسایان کردو خوای گەورەش بەم چەند ئایەتە وەڵامی دانەوەو فەرمانی بە پێغەمبەر ﷺ دا کە بانگیان بکات بۆ نەفرین کردن، جاکاتێ کە پێغەمبەر ئەم ئایەتانەی بۆ خوێندنەوەو بەیانی خۆی‌و حەسەن‌و حوسەین‌و فاتمەی کچی ئامادە بون، ئەوان پەشیمان بونەوەوداوای ئاشتیان کردو پێغەمبەریش ﷺ لێی قەبوڵ کردن‌و گەڕایەوەو نەفرینەکەی نەکردو پەیمانێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا بەست کە ساڵانە دوو هەزار دەست لیباس بدەن بە پێغەمبەر ﷺ هەزاریان لە مانگی رەجەب داو هەزارەکەی تریان لە مانگی سەفەردا. جا بەم شێوەیە خوا داستانی ئەوگەلانەمان بۆ باس دەکات وەك دەفەرموێ:

(٦٢) بە راستی ئا ئەمانەی کەباسمان کردن داستانێکی راست‌و رەوان‌و هیچ پەرەستراوێکی راستین نیە بێجگە لە خودا، وە بەبێگومان کە الله هەر خۆیەتی بە دەسەڵات‌و دانا.

(٦٣) جائەگەر ئەوان پشت لە ئایین هەڵدەکەن ئەوسا بە بێگومان کە الله زانیاری هەیە بەسەر ئەوانەی کە خراپەکارن وسەرەنجام بەتۆڵەی تاوانی خۆیان دەگەن.

(٦٤) ئەی محمد ﷺ بانگیان بکەو بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب وەرن بۆلای کەلیمەیەك کە ئەو کەلیمەیە یەکسانە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا هەر کەس راستر بکات سودی زیاتری دەست دەکەوێت‌و هەر کەسێکیش خراپ تربێت زیانی زیاتر دەکات، ئەو کەلیمەیەش ئەمەیە کە هیچ کاممان بێجگە لە خوا کەس نەپەرەستین‌و هیچ هاوبەشێکیش بۆ خوا دانەنێین‌و هەندێکمان هەندێکمان نەکەین بە پەروەردگارو بیپەرەستین بێجگە لە خوا جا ئەگەر پشت هەڵدەچەرخێنن‌و گوێی پێ نادەن سا بائێوە بەوان بڵێن کەئێوە شایەت بن کە ئێمە موسڵمانین، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٦٥) ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب ئێوە بۆ دەمەقاڵە لە بارەی ئیبراهیمەوە دەکەن خۆ تەورات‌و ئینجیل نەهاتوە مەگەر پاش ئیبراهیم ئایا ئێوە بیرناکەنەوە بزانن چی دەڵێن؟ واتە جولەکە بەوکەسانە دەوترێت کە تەورات‌و فەلەش بەوکەسانە دەوترێت کەئینجیلیان بۆ هاتووە ئەم دوانەش چەندین ساڵ پاش ئیبراهیم هاتوون ئیتر چۆن جولەکە دەڵێن: ئیبراهیم جولەکەیە وفەلەش دەڵێن: فەلەیە؟!

إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْقَصَصُ الْحَقُّ ۚ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا اللَّهُ ۚ وَإِنَّ اللَّهَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٢﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِالْمُفْسِدِينَ ﴿٦٣﴾ قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَىٰ كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللَّهِ ۚ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴿٦٤﴾ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تُحَاجُّونَ فِي إِبْرَاهِيمَ وَمَا أُنزِلَتِ التَّوْرَاةُ وَالْإِنجِيلُ إِلَّا مِن بَعْدِهِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَا أَنتُمْ هَٰؤُلَاءِ حَاجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَاجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِ عِلْمٌ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى النَّاسِ بِإِبْرَاهِيمَ لَلَّذِينَ اتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا النَّبِيُّ وَالَّذِينَ آمَنُوا ۗ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ وَدَّت طَّائِفَةٌ مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَوْ يُضِلُّونَكُمْ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّا أَنفُسَهُمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿٦٩﴾ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٧٠﴾

(٦٦) وریابن وائێوە توانیتان کە دەمەقاڵەتان کرد لە بارەی ئەو شتانەوە کە دەیزانن، دەی چۆن لە بارەی شتێکەوە کەنایزانن دەمەقاڵەوکێشمەکێش دەکەن؟ وە خوا هەمو راستیەکانی لایەو دەیزانێت، بەڵام ئێوە نایزانن. واتە خوا ئیبراهیم دەناسێت چۆنە نە ئێوە کە بە کەیفی خۆتان بەبێ زانیاری باسی دەکەن، ئینجا روون تر خوا دەمکوتیان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٦٧) ئیبراهیم نە جولەکە بووەو نە فەلە بەڵکو ئیبراهیم کەسێکە کە لای داوە لە هەمو ناحەقییەك‌و موسڵمانەو گەردن کەچە بۆ خواو هەرگیز لە موشریکان نەبوە. ئا بەم شێوەیە خوای گەورە قسەی هەرسێ رێبازی کۆنی لە سەر ئیبراهیم سڕیەوەو هەموویانی بە درۆ خستەوە، چونکە هەریەك لەوانە دەیان وت: ئیبراهیم لە ئێمەیە، خوا دەفەرموێ: لە هیچ کامیان نیەو پەیڕەوی راستەقینەی خوایەو پێغەمبەرێکی بت شکێن‌و کۆڵنەدەر بووەو ئەم رەوشتەش رەوشتی ئەم پێغەمبەرەی ئاخر زەمانەو پەیڕەوانی راستەقینەی ئەوون وەك دەفەرموێ:

(٦٨) نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە ئەو کەسانە بون کەلەسەردەمی خۆیدا پەیڕەوی ئەو بوون‌و بە فەرمانی ئەو هەڵس‌وکەوتیان کردووە ئا ئەم پێغەمبەرەیە کە ئەمرۆ هاتوە بەم قورئانەوەو ئەو کەسانەن کە باوەڕیان هێناوە بەم پێغەمبەرە ﷺ ئەوانە دۆستی نزیکی ئیبراهیمن(علی نبینا و علیه السلام) وە

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَلۡبِسُونَ ٱلۡحَقَّ بِٱلۡبَٰطِلِ وَتَكۡتُمُونَ ٱلۡحَقَّ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٧١﴾ وَقَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامِنُواْ بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَجۡهَ ٱلنَّهَارِ وَٱكۡفُرُوٓاْ ءَاخِرَهُۥ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَا تُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّا لِمَن تَبِعَ دِينَكُمۡ قُلۡ إِنَّ ٱلۡهُدَىٰ هُدَى ٱللَّهِ أَن يُؤۡتَىٰٓ أَحَدٞ مِّثۡلَ مَآ أُوتِيتُمۡ أَوۡ يُحَآجُّوكُمۡ عِندَ رَبِّكُمۡۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٧٣﴾ يَخۡتَصُّ بِرَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مَنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِقِنطَارٖ يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ وَمِنۡهُم مَّنۡ إِن تَأۡمَنۡهُ بِدِينَارٖ لَّا يُؤَدِّهِۦٓ إِلَيۡكَ إِلَّا مَا دُمۡتَ عَلَيۡهِ قَآئِمٗاۗ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لَيۡسَ عَلَيۡنَا فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ سَبِيلٞ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾ بَلَىٰۚ مَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ وَٱتَّقَىٰ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا أُوْلَٰٓئِكَ لَا خَلَٰقَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَلَا يُكَلِّمُهُمُ ٱللَّهُ وَلَا يَنظُرُ إِلَيۡهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَلَا يُزَكِّيهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٧٧﴾

خوداش دۆستو یارمەتی دەری خاوەن باوەڕانە. جا برایانو خوشکانی خوا ناس چ لەمە خۆشترە کە ئێمە لەو کەسانە بین کە خوا دۆستو یارمەتی دەریان بێت؟ ئینجا لە فڕو فێڵی دوژمنان ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێ:

﴿٦٩﴾ خۆ کۆمەڵێك لە ئەهلی کتێب ئاوات دەخوازن بۆ ئەوەی کە ئێوە گومڕا بکەنو لاتان بدەن لە سەر ئاینی ئیسلام، بەڵام هەرکەسێك راست بێت ئەوان ناتوانن هیچی لە گەڵدا بکەن وەك دەفەرموێ: وە ئەوان گومڕا ناکەن مەگەر نەفسی خۆیان،وە ئەمانە هەست ناکەنو نازانن کە چاڵکەن خۆی لە بنی چاڵدایەو تەنها خۆیان زیان ئەکەنو موسڵمانی راست ناگۆڕێتو نادۆڕێت.

خوای خاوەن تواناو بە سۆز کوفرو بێ ئایینی پێ خۆش نیەو جارێکی تر بانگ دەکاتە ئەهلی کتێبو دەفەرموێ:

﴿٧٠﴾ ئەی ئەهلی کتێب بۆ ئێوە بێ باوەڕن بە ئایەتەکانی خوا خۆ خۆتان شایەتن لە سەر راستی ودروستی محمدﷺ و بەرنامەکەی؟.

دیسان خوای میهرەبان بانگیان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٧١﴾ ئەی ئەهلی کتێب بۆ حەقو ناحەق تێکەڵاوی یەکتر دەکەنو ئەوەی راستە لە پەڕاوەکانتاندا هاتوەو دەیشارنەوەو ئەوەی ناڕاستە باسی دەکەنو بڵاوی دەکەنەوە، وە خۆتان دەزانن کە ئەم کارەتان شتێکی نادروستو نارەوایە ئیتر بۆ ئەوئیشە دەکەن؟

ئینجا خوای گەورەشێوەیەکی تری فڕو فێڵی کافرانمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٧٢﴾ تاقمێك لە ئەهلی کتێب بە جەماعەتەکەی خۆیانیان دەوت: باوەڕ بهێنن بەوەی کە دابەزیوەتە سەر باوەڕداران تاقی بەیانیانو دەنگو باسیان بزانن و لە ئاخیری رۆژدا بگەڕێنەوە بەڵکو ئەوانیش بگەڕێنەوە. بەڵێ خوانەناسان بەم ئیشەیان دوومەبەستی خەتەرناکیان هەبو، **یەکەم** ـ بەم شێوەیە دەتوانن دەنگو باسی ناوخۆی موسڵمانان بزانن. **دوهەم** ـ بەم ئیشەیان کار بکەنە سەر باوەڕی باوەڕداران ودوودڵی دروست بکەن لەناویاندا و لەم لاولاش بڵێن، ئەگەر ئیسلام راستو چاك بوایە ئێمە پەشیمان نەدەبوینەوە، وە ئەمەش رێگایەکی زۆر شەیتانانەیە بۆ پاشگەز کردنەوەی خاوەن باوەڕان، بەڵام بێ باوەڕان با چاك بزانن، ئەم جۆرە ئیشانە ئاشکراو ناسراوە لە ناو موسڵماناندا و ناتوانن بەو شێوە فڕو فێڵانە زیان بە بیرو باوەڕی خاوەن باوەڕان بگەیەنن چونکە بەکوێرایی چاوی دژمنان خوای زانای باڵادەست دۆستو یارمەتی دەری خاوەن باوەڕانەو لەپیلانی دوژمنان پارێزەریانە. بەڵێ خوای گەورە درێژە دەدات بە رۆشن کردنەوەی فڕو فێڵەکانیانو دەفەرموێ:

﴿٧٣﴾ ئەوان بەئێوە دەڵێن: باوەڕ نەکەن بە هیچ کەسێك مەگەر ئەو کەسەی کە پەیڕەوی ئاینی خۆتان بێت واتە کەس بە راست نەزانن و بە گوێی کەس نەکەن مەگەر ئەو کەسە لە سەر دینی خۆتان بێت، چونکە ئەوان کەس بە راست نازانن بێجگە لە خۆیان، جو، هەر جو بەراست دەزانێو فەلەش هەر فەلە، ئەوەتە خوا بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: هیدایەت هەر هیدایەتی خوایەو بەس. ئەوانیش دەڵێن: هەرگیز باوەڕ نەکەن کە بە هیچکەس درابێت وێنەی ئەوەی کە دراوە بە ئێوە. بەم شێوەیە ئەمانە خۆیان بە گەلی هەڵبژاردەی خوا دەزانن و پێیان وایە کە هیچکەسێکی تر بێجگە لەوان مافی پێغەبەرایەتی نیەو نابێت، هەرچەند ئەمەش قسەیەکی سەرزارەکییەو خۆیان دەیان زانی کە پێغەمبەرمانﷺ راستەو لە غەیری ئەوانیشەو دەیان وت: قسەیان بۆ نەکەن تا نەبێت بە بەڵگە لە سەرمان، یان ئەوانە بتوانن موجادەلە بکەن لە گەل ئێوەدا لە رۆژی قیامەتدا؟! ئەی محمد ﷺ بڵێ: تەواوی فەڕو خێر بە دەستی خوایەو دەی دات بە هەرکەسێك کە خۆی ئارەزۆی لێ بێت کەس ناتوانێت بەرگری بکاتو پێغەمبەرایەتیش بە شێکە لەوفەڕوخێرەو بەدەست خوایە و خۆی دەزانێت بە کێی دەدات، وەبە راستی خوا فرەوانە لە هەمو بارێکەوەو زانایە بە ئیشو کاری ئیستاو لەمەوبەرو ئایندەو کەیو چۆنو لە کوێدا بوەو

دەبێت‌و دابەش کردنی نیعمەتەکانی هەمووی لە روی زانین‌و ئاگاییە نەك هەروا ئیشێکی گۆترەکاری بێت.

(٧٤) جا ئیتر لە سەر ئەو زانینەی خۆی رەحمەت‌و سۆزی خۆی دەڕژێنێت بە سەر ئەو کەسەدا کە ئارەزۆی لێ بێت، وە خوا خاوەنی خەیرو بەرەکەتی گەورەیە جا لەو بەرەکەت‌و فەڕەی بەخشی بە هەر کەس، پێویستە ئەویش سوپاسی بکات و پەیڕەوی فەرمانەکانی بکات چونکە شوکری نیعمەت نیعمەت زیاد دەکات‌و کوفری نیعمەت نیعمەت لە بەین دەبات. وەکو لە سورەتی ئیبراهیم ئایەتی حەفتەم دا دەفەرموێ: ﴿باس بکە ئەو کاتەی کە خوای تۆ جاڕی داو فەرمووی: ئەگەر سوپاسم بکەن زیادی ئەکەم و ئەگەر بێ منەت بن سزام زۆر سەختە﴾.

(٧٥) جا ئەهلی کتێبیش هەمووی وەکو یەك نین خوای گەورە بڕیارەکانی دادپەروەرانەیە هەر کەس بە گوێرەی خۆی حیسابی لە گەڵدا دەکات‌و دەفەرموێ: لە ناو ئەهلی کتێبدا کەسی واهەیە کەئەگەر بە ئەمینی دابنێیت و سەروەتێکی زۆری پێ بدەیت هەر کاتێ کەداوای لێ بکەیتەوە پێت دەداتەوەو کەسی وایشیان هەیە ئەگەر یەك دیناری بدەیتە دەستی هەرچەند شتێکی زۆر کەمە بەڵام ئەو نایداتەوە مەگەر هەمیشە بە سەر سەریەوە بیت‌وبتوانی لێی وەرگریتەوە، بۆ؟ لە بەر ئەوەی کەدەڵێن: ئەوانە نەخوێندەوارن‌و مافی هیچیان نیەو بە مرۆڤ حیساب نین لە لای ئێمە، واتە هەمو ماڵی خەڵك بە ماڵی خۆیان دەزانن‌و چۆن دەستیان بکەوێت بە حەلاڵی دەزانن ئا ئەمەیە رەوشتی جولەکەو فەلە سەبارەت بە خەڵکی تر کەچی بۆ چاو بەستنی خەڵك لافی مافی مرۆڤو ئینسان دۆستی لێ دەدەن؟! وە ئەم بڕیارەی خۆیان بە قسەی خوا دادەنێن!! بەڵام خوای میهرەبان‌و زاناو دانا بە توندی لە دەمیان دەدات‌و ئەو قسەیشیان وەکو باقی قسەکانی تریان بە درۆ دەخاتەوەو دەفەرموێ: ئەوسا ئەمانە درۆ بە دەمی خواوە دەکەن‌و خۆیشیان دەزانن کە درۆیە. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٧٦) وانیە کە ئەوان بۆی دەچن‌و دەیڵێن، هەر کەسێك ئەو عەهدو پەیمانەی کەداوێتی بە خوای خۆی بباتەسەرو لە خوای خۆی بترسێت، ئەوەیە مرۆڤی راست‌و دروست‌و پەرهیزکار ئەوسا بە بێگومان الله یش مرۆڤی پەرهیزکاری خۆش دەوێت. نەك مرۆڤی خۆ بە زل زان‌و تاوانبارو بێ رەوشتی وەك ئەو درۆزنانە. ئینجا خوای گەورە باسی پەیمان شکێنان‌و پاشگەز بوان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٧٧) بەبێگومان ئەوکەسانەی کە ئەو عەهدو پەیمانەی کە بە خوایان داوەدەفرۆشن بە بەهرەیەکی کەم. واتە پەیمان‌و ئایینەکەی خوا لە بەر شتێکی کەم وەکو مەقام‌و شۆرەت‌و پارەو خۆشگوزەرانی دەگۆڕنەوەو ڕێبازو بەرنامەی جگە لە بەرنامەی خوا وەردەگرن ئەوانە هیچ بەشێکی چاکیان نیە لە قیامەتداو خوای گەورە قسەیان لە گەڵدا ناکات و بەمیهرەبانیەوە تەماشایان ناکات لە رۆژی قیامەتداو لەتاوان پاکیان ناکاتەوەو بۆ ئەوان هەیە سزایەکی دەردناك. بەڵێ ئەوە پاشەرۆژو ئایندەی چاوەڕێ کراوی ئەو کەسانەیە کە ئایینی خودا بە جێ دەهێڵن‌و دوای ئەم‌و ئەو دەکەون بۆ خاتری لوقمە نانێکی حەرام‌و تەرام. لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی بوخاری لەعەبدوڵا ی کوڕی ئەبی ئەوفاوە هێناویەتی دەڵێت: پیاوێك لە بازاڕدا هەندێ کەلو پەلی دانابو بۆ فرۆشتن‌و سوێندی بە خوا دەخوارد کە ئەوەندەم پێ داوە، کە پێی نەدابو، بۆ ئەوەی بەو سوێندە پیاوێکی موسڵمان بخەڵەتێنێت، لە بەر ئەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە.

هەروەها سەبارەت بەو کەسانەی کە خوای گەورە لە رۆژی قیامەتدا قسەی خۆشیان لە گەڵ ناکات‌و تەماشایان ناکات‌و لە تاوان پاکیان ناکاتەوە ئەم دوو فەرموودەیەی پێغەمبەرمان ﷺ ئەخەمە پێش چاوتان تا بیان ناسن‌و خۆتانیان لێ دوور بگرن.

١ـ لە ئەبو زەڕەوە کەدەڵێت پێغەمبەری خوادەفەرموێ:{ثَلَاثَةٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ عَز وَجَل يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فَقَرَأَهَا رَسُولُ اللهِ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ فَقَالَ أَبُو ذَر خَابُوا وَخَسِرُوا خَابُوا وَخَسِرُوا قَالَ الْمُسْبِلُ إِزَارَهُ وَالْمُنَفِّقُ سِلْعَتَهُ بِالْحَلِفِ الْكَاذِبِ وَالْمَنَّانُ عَطَاءَهُ/ مسلم/پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: سیان هەن خودا قسەی باشیان لە گەڵدا ناکات‌و لە رۆژی قیامەتدا بە سۆزەوە تەماشایان ناکات‌و پاکیان ناکاتەوە لە تاوان، وە بۆ ئەوان سزایەکی زۆر بە ئێش‌و ئازار هەیە، جا پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بەسەرداخوێندنەوە. جائەبوزەر سێ جار وتی: رەنجەڕۆو پەشیمانن. کێن ئەوانە؟ فەرموی: ئەو کەسەی کەکراسەکەی ئەکشێ بە زەویداو ئەو کەسەی کە سودی کەل‌و پەلەکەی بە سوێندی درۆ زیاد ئەکات‌و ئەو کەسەی کە منەت دەخاتە سەرپێ بەخشراو}

٢ـ لە ئەبو هریرەوە دەڵێت: پێغەمبەری خوادەفەرموێ:{ثَلَاثٌ لَا يُكَلِّمُهُمْ اللَّهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَلَا يَنْظُرُ إِلَيْهِمْ وَلَا يُزَكِّيهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ رَجُلٌ عَلَى فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلَاةِ يَمْنَعُهُ مِنْ ابْنِ السبِيلِ وَرَجُلٌ بَايَعَ رَجُلًا بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ لَهُ بِاللهِ لَأَخَذَهَا بِكَذَا وَكَذَا فَصَدقَهُ وَهُوَ عَلَى غَيْرِ ذَلِكَ وَرَجُلٌ بَايَعَ إِمَامًا لَا يُبَايِعُهُ إِلا لِدُنْيَا فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا وَفَى وَإِنْ لَمْ يُعْطِهِ مِنْهَا لَمْ يَفِ /مسلم وغ ة/ سیان هەن خودا قسەی باشیان لە گەڵدا ناکات‌و لە رۆژی قیامەتدا بە سۆزەوە تەماشایان ناکات‌و پاکیان ناکاتەوە لە تاوان وە بۆ ئەوان هەیە سزایەکی زۆر بە ئێش‌و ئازار یەکەمیان: پیاوێکە لەچۆڵەوانییەکدا ئاوێکی زیاد

وَإِنَّ مِنۡهُمۡ لَفَرِيقٗا يَلۡوُۥنَ أَلۡسِنَتَهُم بِٱلۡكِتَٰبِ لِتَحۡسَبُوهُ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمَا هُوَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَقُولُونَ هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَمَا هُوَ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ وَيَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٧٨﴾ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤۡتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُواْ عِبَادٗا لِّي مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن كُونُواْ رَبَّٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمۡ تُعَلِّمُونَ ٱلۡكِتَٰبَ وَبِمَا كُنتُمۡ تَدۡرُسُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًاۗ أَيَأۡمُرُكُم بِٱلۡكُفۡرِ بَعۡدَ إِذۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿٨٠﴾ وَإِذۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ لَمَآ ءَاتَيۡتُكُم مِّن كِتَٰبٖ وَحِكۡمَةٖ ثُمَّ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مُّصَدِّقٞ لِّمَا مَعَكُمۡ لَتُؤۡمِنُنَّ بِهِۦ وَلَتَنصُرُنَّهُۥۚ قَالَ ءَأَقۡرَرۡتُمۡ وَأَخَذۡتُمۡ عَلَىٰ ذَٰلِكُمۡ إِصۡرِيۖ قَالُوٓاْ أَقۡرَرۡنَاۚ قَالَ فَٱشۡهَدُواْ وَأَنَا۠ مَعَكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨١﴾ فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٨٢﴾ أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴿٨٣﴾

لەخۆی لەلا هەبێتو نەیدا بە ڕێبوار. **دووهەم**: پیاوێکە پاش عەسر سوێند بخوات بەخوا لە سەر فرۆشتنی کەلو پەل کەبەئەوەندەی کڕیوەوکابرا باوەڕی پێ بکات بەڵام قسەکەی ئەوراست نەبێت. **سێهەم**: پیاوێکە هەر لەبەر دەستکەوتێکی دنیایی پەیمان بدات بە پێشەوای موسڵمانان جا ئەگەر شتی پێدا پەیمانەکەی بباتە سەر، وە ئەگەر شتی پێنەدا نەیباتە سەر} هەروەها سەبارەت بە دابەزینی، ئەم ڕیوایەتەی تریش هاتوە کە دەڵێت: لە نێوان ئەسعەس ناوێکی سەحابەداو پیاوێکی جوولەکەدا لە سەر زەوی دەمەقاڵەیەك پەیدا بو کێشەکەیان گەیاندە پێغەمبەر ﷺو فەرموی بە ئەسعەس:{**أَلَكَ بَيِنَةٌ فَقُلْتُ لَا فَقَالَ لِلْيَهُودِي احْلِفْ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ إذَنْ يَحْلِفُ فَيَذْهَبُ بِمَالِي فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى إن الذِينَ يَشْتَرُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَأَيمَانِهِمْ ثَمَنًا قَلِيلًا إلَى آخِرِ الآيةِ** / ا د والترمذى وصححه الالبا / ئایا شایەتت هەیە؟ وتم: نەخێر. فەرموی: بە جووەکە سوێند بخۆ، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر وابێت ئەو سوێند دەخواتو ماڵەکەم دەبات لەو کاتەدا ئەم ئایەتەی سەرەوە دابەزی} ئینجا خوا سیفەتێکی تری ئەهلی کتێب باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٧٨﴾ بە بێشك کە لەناو ئەواندا کۆمەلێك هەیە کە زمانیان لادەدەن بە هەندێك لەو کتێبەی کەلایانەو دەیگۆڕنو مانای وا لێ دەدەنەوە کە هیچ کات ناگونجێ پەیوەندی بە خواوە هەبێت، تا ئێوە وا هەست بکەن کە ئەوەش بەشێکە لەو کتێبەو قسەی خودایە لەحاڵێکدا کەئەوە هیچ پەیوەندی نیە بە کتێبی خوداوە، وە دەڵێن: ئەوە لە لایەنی خواوە هاتوە لەحاڵێکدا کە ئەوە لە لایەنی خوداوە نەهاتوە، وەئەوان درۆ بە دەمی خوداوە دەکەنو خۆشیان دەزانن کەقسەکانیان درۆیە؟! ئەمە سیفەتی کۆمەڵێکە لە ئەهلی کتێب کە سڵ لە هیچ درۆیەك ناکەنو چی بێت بەدەمیاندا بێ ترسانە دەیڵێن جا کەسێك کە لە خوا نەترساو درۆی بە دەمی خوداوە هەڵبەستو ئەوەی کەناڕەوا بو وتی، ئایا ئەوە لە منو تۆ دەترسێت؟ ئایا دەگونجێت کە ئەوە خیانەتمان لە گەڵدا نەکات؟ ئێمە ئەوەندە سادەو خۆش باوەڕین خۆمان دەدەین بە دەست ئەوانەوەو دەڵێین ئەوان ئێمە دەژیێننو کۆمەکمان پێ دەکەنو دلسۆزمانن؟! ئەمە لە حاڵێکدایە کە لەسەداهەشتای سامانی جیهان لەدەست ئێمەدایە کە ئێمە لەسەدا پێنجی جیهانین بە گوێرەی ئامارێك کەخۆیان بلاوی دەکەنەوە، دەی ئایا ئەوان ئێمە دەژیێنن یان ئەوان بەسەر ئێمەوەدەژینو دەمیان ناوەتە ناوسکمانوسامانمان دەخۆنوچاویان کوێر کردوین تاهیچ شتێك نەبینینو بەقسەی ناڕەواو روکەش کوێچکەیان پڕ کردوین تاهیچ قسەیەکی راستورەوا نەبیستینودەستیان ناوەتەبینمان تا هاوارنەکەینو عەقڵیان کڕیوین تابەسازی ئەوان هەڵپەڕینو نەوتی ڕەشمان وەك روباربەنو کیمیایو ژاری سپیمان بەهەدیە بۆبنێرن؟!! ئەی موسڵمان تاکەی هەروابێهۆش دەبیت؟ ئینجا دەفەرموێ:

﴿٧٩﴾ بۆهیچ کەسێك نیە کە خوا کتێبو حوکمو پێغەمبەرایەتی پێ دابێت لە پاشان بە خەڵك بڵێت: وەرن بەندەی من بن، واتە چۆن دەگونجێت کەسێك کەخوا ئەو هەمو نیعمەتەی پێ دابێت وەك عیسا کەچی بڵێت: وەرن جگە لەخودابەندەی من بن؟ بەڵام ئەو پێیان دەڵێت: خودا بپەرستنو داناو زاناو بە حەوسەڵە بن بە هۆی ئەوەوە کە ئێوە خەڵکی فێری کتێب دەکەن، وە بە هۆی ئەوەوە کە دەیخوێننەوە واتە: ئەگەر ژیر بن دەبێ ئەو فێر کردنو فێر بونە وا لە ئێوە بکات کە داناو زاناو بە حەوسەڵەو خوا ناس بنو نابێ هیچ زانایەك لە هیچ سەردەمێك بڵێت وەرن بۆ لای من پێویستە بڵێت وەرن بۆ لای کتێبەکەی خوا، وە کتێبی خوایان بۆباس بکاتو دوریان بخاتەوە لە مرۆڤ پەرستیو بڵێت: ئەمەیە ڕێگای حەقو ڕاست.

﴿٨٠﴾ هەرگیز ئەو مرۆڤە بەنرخانەی کە کتێبیان بۆ هاتبێ نەیان وتوە وەرن مەلائیکەو پێغەمبەران بکەن بە خوای خۆتان، ئایا دەستورتان پێ دەدەن کە کافر بن پاش ئەوەی کە موسڵمان بوون؟ شتی ئاوەها بۆ ئەومرۆڤە بەنرخانە نەگونجاوە جابەم شێوەیە بیرو باوەڕی بت پەرستانو جوولەکەو فەلە هەڵدەوەشێنێتەوە،

چونکە یەکەمیان بەشێکیان فریشتەکانیان دەپەرستو جولەکە عوزەیرو فەلەکان عیسا.

(٨١) ئەی محمد ﷺ باس بکە بۆ ئەوان کاتێ کە خوا پەیمانی وەرگرت لە هەمو پێغەمبەران هەرچەند لە کتێبو ژیریم بۆرەوانەکردبن لە پاشان پێغەمبەرێك بێتە لاتان کە دان بنێت بەوەی کە لای ئێوەیەدایەو بەراستی بزانێت دەبێ ئێوە ئیمانی پێ بهێنن‌و دەبێ یارمەتیشی بدەن، ئینجاخوا فەرموی: ئایا ئێوە پەیمانتان داو ئەم بارە گرانەتان وەرگرت؟ وتیان: بەڵێ ئێمە پەیمانمان دا خوای گەورەش فەرموی: ئەوسا هەموتان شایەت بن و منیش لە گەل ئێوەدا لەو شایەتانەم کەپەیمانتان داوە. بەڵێ بەم شێوەیە خوای زاناو دانا پەیمانی لە تەواوی پێغەمبەران وەرگرتوە کە دەبێ باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەری پاش خۆیان ئەگەر هاتو یارمەتیشی بدەن ئەمەش ئەوەدەگەیەنێ کە **یەکەم**: واتە هەمو پێغەمبەران لە لایەن یەك کەسەوە هاتوون کە خوایە. **دووهەم**: پێغەمبەران لە بناغەی ئاییندا هەمویان خاوەنی یەك بەرنامەو رێبازن‌و هیچ جیاوازیان نیە واتە لە مەسئەلەی تەوحیدی خواداو قیامەتو باوەڕ بە فریشتەو کتێبو پێغەمبەران یەکن‌و هیچ جیاوازیەکیان نەبووە. ئاشکرایە پێغەمبەرمانﷺ کە ئاخرین پێغەمبەرە ﷺ ئەگەر تەواوی پێغەمبەران لە سەردەمی هاتنی ئەودا لە ژیاندا بونایە دەبوایە باوەڕیان پێ بهێنایەو یارمەتیان بدایە، چونکە بە هەمویان وتراوە دەبێ ئیمانی پێ بهێنن‌و یارمەتی بدەن وەکو عەلی‌و عەبدولای کوری عەباس دەڵێن (خوا هیچ پێغەمبەرێکی رەوانە نەکردوە مەگەر لەو پەیمانی وەرگرتبێ کە ئەگەر خودا محمدی ﷺ ناردو ئێوە لە ژیاندا بوون دەبێ باوەڕی پێ بکەن‌و یارمەتی بدەن، وە خودا فەرمانیشی پێ داوە کە فەرمان بە گەلەکەیشی بکاتو پەیمانیان لێ وەربگرێت کە ئەگەر محمد هاتو ئێوە زیندو بون باوەڕی پێ بکەن‌و یارمەتی بدەن) تەفسیری تەبەری. عەبدولای کوڕی سابت دەڵێت: عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من بە لای برادەرێکی بەنی قورەیزەم دا رۆیشتم چەند شتێکی پڕ مانای لە تەورات بۆ نوسیمەوە ئایا پێشانت نەدەم؟ عەبدولا دەڵێت: رەنگی دەمو چاوی پێغەمبەر ﷺ گۆڕا، عەبدولا دەڵێ: وتم بە عومەر مەگەر تۆ روخساری پێغەمبەر ﷺ نابینی؟ عومەر گورج وتی: رازین کەخوا پەروەردگارمان بێتو ئیسلام دینمان بێتو محمد پێغەمبەرمان بێت. عەبدولا دەڵێت: روخساری پێغەمبەر ﷺئەو نارەحەتیەی لە سەر لاچوو جا فەرموی:{وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَصْبَحَ فِيكُمْ مُوسَى ثُمَّ اتَّبَعْتُمُوهُ وَتَرَكْتُمُونِي لَضَلَلْتُمْ إِنَّكُمْ حَظِّي مِنْ الْأُمَمِ وَأَنَا حَظُّكُمْ مِنْ النَّبِيِّينَ / ا د وحسنه الالبا / سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە ئەگەر موسا ئێستا لە ناو ئێوەدا بێتو لە پاشان ئێوە دوای ئەو بکەون‌و واز لە من بهێنن، گومڕا بوون چونکە ئێوە بەشی منن لە گەلان‌و منیش بەشی ئێوەم لە پێغەمبەران}

قُلْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمْ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ وَنَحْنُ لَهُۥ مُسْلِمُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٨٥﴾ كَيْفَ يَهْدِي ٱللَّهُ قَوْمًا كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ وَشَهِدُوٓا۟ أَنَّ ٱلرَّسُولَ حَقٌّ وَجَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِي ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٦﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُمْ أَنَّ عَلَيْهِمْ لَعْنَةَ ٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿٨٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يُخَفَّفُ عَنْهُمُ ٱلْعَذَابُ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٨٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بَعْدَ إِيمَٰنِهِمْ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّن تُقْبَلَ تَوْبَتُهُمْ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلضَّآلُّونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يُقْبَلَ مِنْ أَحَدِهِم مِّلْءُ ٱلْأَرْضِ ذَهَبًا وَلَوِ ٱفْتَدَىٰ بِهِۦٓ ۗ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٩١﴾

جا کاتێ پێغەمبەران بۆیان رەوا نەبێت رێگای خۆیان بگرن‌و واز لە رێگای پێغەمبەر بهێنن ئەی چۆن رەوایە کە ئێمە پەیڕەوی خەڵکی ئاسایی بکەین‌و رێبازەکانیان هەڵبژێرین‌و واز لە رێبازی پێغەمبەر ﷺ بهێنین؟ جاپاش ئەو پەیمانە دەفەرموێ:

(٨٢) ئەوسا هەر کەسێك پاش ئەوەی کە ئەم هەمو راستیانەی بۆ دەرکەوت، ئەگەر بێتو پشتی تێ بکات دەی ئیتر ئەوانە فاسقن‌و لە ئاینی ئیسلام دەردەچن‌و کافر دەبن.

(٨٣) دەی ئایا ئێوەجگە لەئاینی خواتان دەوێت؟ لەحاڵێکدا ئەوەی کە لە ئاسمانەکان‌و زەوی دایە هەمویان تەسلیم‌و گەردن کەچی ئەوون ئیتر پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆش بێتو بۆ لای ئەو دەبرێنەوە بۆ پاداشتو بۆ سزا. بزانن لە راستی دا ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەوی دا هەیە هەموی گەردن کەچی خوایە تەنانەت مرۆڤ وجنۆکەیش. بۆ نمونە: کابرایەکی کافر چۆن دروست بوە نەی توانیوە خۆی بگۆڕێت کەی دروست بوەو کەی دەمرێتو چۆن هەناسەی دێتو دەچێت، رەش بێت یان سپی، بەرز بێت یان نزم، جوان بێت یان ناشیرین...و.. هتد. هیچ کامیانی بە دەست خۆی نیە هەموی لە ژێر قانونێکدایەکە خودا بۆی داناوە. تەنها خوا کردویەتی بە سەر پشك لە بەشێکی کەم دا

کەهەڵبژاردنی چاك یان خراپو هەنگاوبۆنانی، جاله سەر ئەو بەشە کەمە بەهەشت یان دۆزەخی پێ دەدرێت واتە موسڵمان بە دڵو بە لەش تەسلیمی خودایە بەڵام کافر دڵەکەی سەرکەشە ئەویش بە فەرمانی ﷲ کە هەر لەسەرەتاوە بڕیاری داوە کە مرۆڤ لەو بەشەدا سەرپشك بێت، ئیتر هەموشتەکانی تری لەشی تەسلیمی خودایەو توانای هیچ گۆڕانکاریەکی نیە. ئینجا خوای باڵادەست بەرەو ئایین بانگمان دەکاتو دەفەرموێ:

(٨٤) ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئێمە ئیمانمان هەیە بە خواو بە ئەوەی کە رەوانە کراوە بۆسەر ئێمەو بۆ سەر ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوب وئەسباتو ئەوەی کە دراوەبە موساو عیساو تەواوی پێغەمبەرانی تر هەموی لەلایەن پەروەردگاری خۆیانەوە بووە کە ئێمە لە نێوانی ئەو پێغەمبەرانە دا هیچ جیاوازیەك دانانێینو ئێمە هەر بۆ ئەو گەردن کەچین. هەمان ئایەت لە سورەتی بەقەرەدا هەبو لە گەل کەمێ جیاوازیدا، لەوێ فەرمان درا کەهەمومان بڵێین، لێرەدا بە پێغەمبەر دەفەرموێت بڵێ: چونکە پێغەمبەرمانﷺ قسە دەکات لە گەل وەفدەکەی نەجەران داو خودابەو دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ تۆ بڵێ. لێرەدا فەرموی: ﴿وَٱلنَّبِيُّونَ﴾ آل عمران: ٨٤، لەوێ فەرموی: ﴿ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ ﴾**البقرة: ١٣٦** لێرە دەگونجێت هەر بە هەمان مانای ئەوێ بێت، وە دەشگونجێت بگەڕێتەوە سەر وشەی ﷲ واتە باوەڕمان هەیە بە تەواوی پێغەمبەران، هەر خوایش زانایە. بەڵێ ئەوەیە رێبازی راستو دروستو نابێ پەیرەوی شتێکی تر بکرێتو هیچ بەرنامەیەکی تر بە راست بزانرێت بۆیە دەفەرموێ:

(٨٥) جا هەر کەسێك رێبازێك بێجگە لە رێبازی ئیسلام هەڵبژێرێت ئەوسا با بزانێت هەرگیز لێی وەرناگیرێتو ئەو لە رۆژی قیامەتدا لە ریزی زیان لێکەتوانە. دەی بە ناو موسڵمان ئیتر چۆن دەتوانێت رێبازێك بێجگە لە رێبازی خودا وەرگریتو خۆیشت بە موسڵمان بزانیت؟ ئەمەفەرمودەی پەروەردگارتە ژیربەو ورد بەرەوە، بۆ ژیانێکی کورتی دنیایی خۆت شەرمەزاری خوا مەکە، کە رۆیشتیت گەڕانەوەت نیە.

(٨٦) گەلێك پاش ئەوەی کە ئیمانیان هێناوە وشایەتیان داوە کە پێغەمبەر راستەو نیشانە گەلی ئاشکراودڵنیا کەریان هاتەوەتەلاو لە پاشان پاشگەز ببنەوە خوای گەورە چۆن تازەرێنماییان دەکاتو هیدایەتیان دەدات؟ لە راستیدا ئەوانە(المرتدون) ستەمکارنو خوداش گەلی ستەمکار رێنمایی ناکاتو نایگەیەنێت بە خۆشبەختی. جاخوای گەورە باسی سزای دوا رۆژی ئەو هەڵگەڕاوانە دەکاتو دەفەرموێ:

(٨٧) ئەمانە پاداشەکەیان ئەمەیە کە نەفرینی خواو فریشتەکانو هەمو خەڵکیان لە سەرە.

(٨٨) بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو هەرگیز سزایان لە سەر سوك ناکرێتو ئەوان مۆڵەتیش نادرێنو دەبێ زوو بە زوو بخرێنە ناو ئێشو ئازارەوە.

(٨٩) مەگەر ئەو کەسانەی کە لە دنیادا لە هەڵەی خۆیان پەشیمان ببنەوەو پاش ئەو کارە ناپەسەندەیان دان بە هەڵەی خۆیان دا بنێنو ئیشی چاك بکەن، ئەوە ئیتر بە بێگومان کە ﷲ لێبوردەو میهرەبانە بەرامبەر بەو کەسانەی کە ئاوها تاوان دەکەنو لە پاشان پەشیمان دەبنەوە. ئەمە گەورەترین نیشانەی لوتفی خوایە بەرامبەر بە مرۆڤەکانو هیچ خاوەن دەسەڵاتێك ئاوا تاوانبارێکی بێ شەرمو سەرکەش نابەخشێت ئەم جۆرە بەخشینە تەنها لە سۆزە گەورەو هەمە لایەنەکەی ﷲ دەوەشێتەوە ،﴿يَا رَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَعَظِيمِ سُلْطَانِكَ اللَّهُمَّ اغْفِرْلِي﴾.

(٩٠) بە بێگومان ئەوانەی کە کافر بوون لە پاش باوەڕ هێنانیانو رۆژ لە دوای رۆژ درێژە دەدەن بە کوفرەکەیان تا نزیکی مەرگ دەبنەوە ئەوانەهەرگیزتەوبەیان لێ وەرناگیرێتو ئەوانە کەسانێکن کە گومڕا بوونو راستیان لێ ون بوە. واتە ئەوانە کە هەر سورن لە سەر کوفرو بێ باوەڕی ئەگەر جار جاریش تەوبەیان بە دەمدا بێت یان لە کاتی سەرەمەرگدا کە جێگای خۆیان بۆ دەردەکەوێتو تەوبە بکەن ئەو دوو شێوە تەوبە کردنە لای خودا وەرناگیرێت، چونکە تەوبە کاتێ وەردەگیرێت کە گیان نەگاتە بەو جێگایەو بە دڵ کابرا لە تاوانەکانی پەشیمان ببێتەوەو بڕیار بدات کە جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ ئەو تاوانانە، وەئەمە هەڕەشە یەکی گەورەشی تێدایە لە پاشگەز بوان. ئینجا دەفەرموێ:

(٩١) بەبێگومان ئەوانەی کە کافرنو بە کافری دەمرن ئەوسا ئیتر ئەو کافرانە پڕ بە پڕی زەوی هەموی زێڕ بێتو موڵکی ئەوان بێتو بیدەن لە باتی ئەوەی کە لە عەزابی خودا رزگاریان بێت هەرگیزلێیان وەر ناگیرێت، وە بۆ ئەوانە هەیە سزایەکی دەردناكو هیچ یارمەتی دەرێکیان نیەکە کۆمەکیان پێ بکاتو نەخرێنە ناو ئەوسزا سەختەوە. هەروەك لە بارەی عەبدوڵای کوڕی جەدعانەوە کە میوانداری خەڵکی دەکردو بەند کراوی ئازاد دەکردو نان دەر بوو پرسیار کرا لە پێغەمبەرمانﷺ ئایا سودی بۆی دەبێت؟ فەرموی:{لَا يَنْفَعُهُ، إِنَّهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا رَبِّ اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدِّينِ/ مسلم، ١ د/ نەخێر ،سودی بۆی نابێت چونکە ئەو رۆژێ لە رۆژان نەیوتوە: ئەی پەروەردگارم خۆشبە لە تاوانەکانم لە رۆژی قیامەتدا)

لَن تَنَالُواْ ٱلۡبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ﴿٩٢﴾ ۞ كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلّٗا لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسۡرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ مِن قَبۡلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوۡرَىٰةُۗ قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ فَٱتۡلُوهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٩٣﴾ فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٩٤﴾ قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُۗ فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ لَلَّذِي بِبَكَّةَ مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٦﴾ فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَۖ وَمَن دَخَلَهُۥ كَانَ ءَامِنٗاۗ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٧﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٠٠﴾

وە هەر لەم بارەیەوە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:{يُقَالُ لِلرجُلِ مِنْ أَهْلِ النارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَرَأَيتَ لَوْ كَانَ لَكَ مَا عَلَى الْأَرْضِ مِنْ شَيْءٍ أَكُنتَ مُفْتَدِيًا بِهِ قَالَ فَيقُولُ نَعَمْ قَالَ فَيقُولُ قَدْ أَرَدْتُ مِنْكَ أَهْوَنَ مِنْ ذَلِكَ قَدْ أَخَذْتُ عَلَيْكَ فِي ظَهْرِ آدَمَ أَنْ لَا تُشْرِكَ بِي شَيْئًا فَأَبَيتَ إِلا أَنْ تُشْرِكَ بِي /متفق عليه/ بە یەکێك لە ئەهلی ئاگر لە ڕۆژی قیامەتدا دەوترێت، ئایا ئەگەر ئەوەی لە سەر زەویدایە هەموی موڵکی تۆ بوایە دەت دا بۆ ئەوەی لەم سزایە ڕزگار ببیت؟ ئەویش دەڵێت: بەڵێ. خوا دەفەرموێ: بە ڕاستی من شتێکی کەمتر لەوەم لە تۆ دەویست بە ڕاستی تۆ لە پشتی ئادەمی باوکتا بویت من بەڵێنم لێت وەرگرت کە هیچ هاوەڵم بۆ دانەنێیت، جا تۆ ئەمەت نەکردو هاوەڵت بۆ دانام} لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: {فَيُرَدُّ إِلَى النَّارِ/ جا ئەو کابرایە دەگێڕنەوە بۆ ناو ئاگر} ئینجا باسی خاوەن باوەڕان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٩٢﴾ ناگەن بە پلەی بەرز لە چاکەو چاکەکاریدا تا نەبەخشن لەو شتانەی کە خۆشتان دەوێت، وە هەر شتێك ببەخشن خودا پێی دەزانێت پاداشی دەداتەوەو هیچ شتێکی لەلا ون نابێت. ڕاستە مرۆڤی موسڵمان هەر شتێك بدات لە ڕێگەی خودا چاکە، بەڵام ناگات بەو پلە بەرزە هەتا شتە خۆشەویستو چاکەکانی نەبەخشێت، جا کە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ئەبو تەلحە یەکێك بو لە یارمەتی دەرەکانو دەوڵەمەند بو خۆشەویسترین ماڵی بیرێك بو بە ناو (بەیروحائە) لە بەردەم قیبلەی مزگەوتەوە بو شوێنێکی خۆش بو پێغەمبەری خواﷺهەمیشە دەچوو لەو بیرە ئاوی دەخواردەوەو ئیسراحەتی دەکرد وتی: ئەی پێغەمبەری خوا من هیچ ماڵێکم لەو بیرە لە لا خۆشەویستر نیە. خوای گەورەش دەفەرموێ: هەتا لەو ماڵەی کە خۆتان خۆشتان دەوێت نەبەخشن نابن بە چاکە کاری پلە بەرز من وا ئەو ماڵەم بەخشی لە ڕێگەی خودا. پێغەمبەری خواش فەرموی:{بَخٍ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ وَإِني أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الْأَقْرَبِينَ فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللهِ فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِهِ /البخاری/ ئای چەند جوانە، ئەوەماڵێکی چاكو بە سودە، ئەوەماڵێکی چاكو بە سودە، بەڕاستی قسەکەتم بیست بەڵام من پێم خۆشە لە ناو خزمەکانی خۆتدا بێت، ئینجا ئەبو تەلحەش وتی: وادەکەم ئەی پێغەمبەری خوا جا ئەبو تەلحە ئامۆزاو خزمەکانی خۆی بانگ کردو دابەشی کرد بە سەریاندا}

بەڵێ ئەوان ئاوەها ئیشیان بە قورئان دەکرد بۆیە بە ماوەیەکی زۆر کەم ئەو ئاینەیان سەقام گیر کردو سەری خوا نەناسو ستەمکارانیان نەوی کرد، بەڵام بە داخەوە ئێمە ڕۆژانە دەیان ئایەتو فەرمودە دەبیسین وەك ئەوەی لە گەل ئێمەی نەبێت وایە، موسڵمانان وریا ببنەوە بەیانی حیسابە! ئینجا عومەر خوالێی ڕازی بێت کاتێ کە ئەو ئایەتە دابەزی وتی: من تەنها شتێك کەزۆرخۆشەویستە لام ئەو بەشەیە کە لە خەیبەردا بەرم کەوتوە، واتە ئەمەوێت داینێم لە ڕێگەی خودا، چونکە خوا دەفەرموێ: تاکو ئەوەی کە بۆ خۆتان پێتان خۆشە نەی بەخشن ناگەن بە پلەی بەرزی چاکە. وتی چی بکەم؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{فَاحْبِسْ أَصْلَهَا وَسَبلْ الثمَرَةَ/النسائي وصححه الالبا / ئەسڵی ماڵەکە دابنێ و بەروبومەکەی بکە بەخێر باخەڵك بیخوات} کەئەمە پێی دەوترێت وەقف. ئینجا باسی بەنی ئیسرائیلی دەکات چونکە کۆمەڵی لە قەشەکانو جوەکان زۆر هاتو چۆی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد بە تایبەت جوەکان جارێك هاتنو وتیان: چەند شتێك هەیە ئەگەر خەبەری ئەو شتانەمان پێ بدەیت ئێمە ئیتر باوەڕ دەکەین بە تۆ. یەکێك لەوانە ئەوەیە کە یەعقوب کاتی خۆی چ شتێکی لە خۆی حەرام کردوە؟ جا پێغەمبەریش ﷺ بەڵێنی لێ وەرگرتن کە ئەگەر جوابم دانەوە دەبێ ئێوە باوەڕم پێ بکەن، وتیان: بەڵێن بێت. جائەوان چوار شتیان داوا کرد پێغەمبەریش ﷺ هەر چوار شتەکەی ئەوانی وەڵام دایەوە هەتا سێ هەمیان هەر وتیان: ڕاستە. چوارەم پرسیار وتیان: لەفریشتەکان کێ دۆستتە؟ وتی: جبرائیل وەحیم بۆ دێنێتو هەر جبرائیلیش بوە کەوەحی هیناوە بۆ هەمو پێغەمبەران لەوانەش موسا، وتیان: لێرەدا لە تۆ جیا دەبینەوە ئەگەر کەسێکی تر وەحی بۆ تۆ بهێنایە ئێمە قەبوڵمان بو بەڵام مادام جبرائیلە، جبرائیل دوژمنی ئێمە بوەو هەمو سزایەکی ئێمە لە لایەن

ئەووەوە بۆمان هاتوە. ئەوەبو کە خوای گەورەلە سورەتی بەقەرەدا وەلامی دانەوەو فەرموی: هەر کەسێ دوژمنی جبرائیلە هەرچی دەکات بابیکات هەرئەوە دێت بۆ لای تۆو ناشگۆڕێت لە بەر خاتری ئەوان، لێرەش باسی ئەو شتانە دەکات کە زوو قەدەغە بوون و دەفەرموێ:

(٩٣) هەمو خواردنێك حەلاڵە بۆ کوڕانی ئیسرائیل بێجگە لەوەی کە یەعقوب حەرامی کردوە لە سەر نەفسی خۆی (ئیسرائیل واتە یەعقوب ﷵ) گوایە یەعقوب تووشی نەخۆشیەك بووە لە پاشان داوای کردوە لە خوا ئەگەر شیفای بۆ بێت خۆشەویسترین تەعام و شەراب بە لایەوە کە بریتیە لە شیرو گۆشتی وشتر ئەوانە هیچ کامیان نەخوات ئیتر کە شیفای بۆ هاتوە نەی خواردوون ئەمەش لە پێش ئەوەدابوە کە تەورات دابەزێت. بڵێ: ئەگەر لەمەدا رەخنەتان هەیەو وا دەزانن وا نیە جاتەورات بێنن و بیخوێننەوە ئەگەر ئێوە راست دەکەن و قسەی من بە راست نازانن. دەی ئەگەر ئەشزانن قسەی من راستەو هەر بە ئارەزۆی نەفسی خۆتان دژایەتیم دەکەن زۆر چاك بزانن.

(٩٤) هەر کەسێك درۆ بەدەم خوداوە هەڵبەسێت پاش ئەوەی کە راستی بۆ رۆشەن بویەوە ئەوسا ئەوانە ستەمکارن.

(٩٥) ئەی محمد ﷺ بڵێ: خوا راستی فەرموە لەو هەواڵ و دەنگ و باسانەی کەلە قورئاندا هاتوە دەی پەیڕەوی ئایینی ئیبراهیم بن کە ئەو ئیبراهیمە لای دابو لە هەمو بەتاڵ و نارەواییەك بەرەو ئاینی خوا، ئیبراهیم یەکتا پەرەستێکی راست و دروستە و ئیبراهیم لە موشریکان نیە. بەم شێوەیە قورئان رۆشنی کردووە کە ئیبراهیم یەکتا پەرەستێکی راستەقینە بووە رێبازەکەی پاك و خاوێنەو ئەم پێغەمبەرەش ﷺ بە هەمان رێگاو رێچە دا دەچێت.

﴿حَنِيفًا﴾ بە مانای لادانە لە هەمو بەتاڵی ونارەواییەك بۆ رێگای راست. ئینجا دەفەرموێ:

(٩٦) بە بێگومان یەکەم ماڵێك کە دانرا وە بۆهەمو خەڵك کە وەکو یەك تێیدا شەریك بن و بتوانن بێ ترس بەندایەتی تێدا بکەن ئەوماڵەیە کە لە مەکە دایەو بریتیە لە کەعبە. دەی ئەگەر جولەکەو فەلە راست دەکەن خوا پەرستن بۆ ناچن بۆ حەج و عومرەو تەوافی ئەو ماڵەی کە ئیبراهیم سەرلە نوێ بە فەرمانی خوا دروستی کردوە کە جێگایەکی موبارەکەو رێ پێشاندەرە بۆ عالەم. وشەی ﴿بَكَّة﴾ هەندێك دەڵێن: هەر ناوی مەکەیە، وە هەندێکی تر دەڵێن: ﴿بَكَّة﴾ بە خودی کەعبە دەڵێن و بە دەورو بەرەکەی دەوترێت مەکە، دروسترینان یە کەمیانە. بەڵێ ئەو شوێنە مەرکەزی هەمو پێغەمبەران بوە بە تایبەتی ئیبراهیم و ئەو پێغەمبەرانەش کەلە نەوەی ئەون و وەحیش بۆ پێغەمبەرمان دووبارە لەوێوە دەستی پێ کردوە کەوا بو جێگای رێنمایی هەمو خەڵکە تا قیامەت.

(٩٧) لەو شوێنەدا چەندین نیشانەی ئاشکرا و شوێن وەستانی ئیبراهیمی تێدایەو هەرکەسێك بچێتەناویەوە بێترسەو هەرکەسێك توانای رێگای هەبێت پێویستە کەحەج بکات و ئەوماڵە پیرۆزە لەنزیکەوە ببینێت و هەرکەسێکیش کافرو سپڵەو نمەك نەناس بێت ئەوسا بەبێشك خوا بێنیازە لەهەموخەڵك. جا لەونیشانە ئاشکرانە ئاوی زەمزەم وسەفاو مەروا. ئاوی زەمزەم تاقانە ئاوێکە کەمرۆڤ بە بێ خواردن پێی دەژیت وساڵانە لە کاتی حەجدا بەملیونها بۆشکە ئاوی لێ دەردەهێنرێت و هیچ کەمناکاتەوەو لەپاش نەمانی حەجیش هیچ زیادناکات؟! سەفاو مەروا جێگای هاتو چۆ کردنی ئەو ئافرەتیە کاتێك کە نائومێد بو لە هەمو شتێك لەوێدا هاتو چۆی دەکرد تاکو بزانێت جێگای ئومێدێك نابینێتەوە کاتێك کە نائومێد بو لە هەموی خوای گەورە ئەو ئاوەی زەمزەمی پێدا ئەمانە هەموی نیشانەی ئاشکران لە سەر هێزو دەسەڵاتی خوا وە هەروەها مەقامی ئیبراهیم کاتێك کە دیوارەکەی بەرز کردەوە بەردێکیان لە ژێر پێیدا دانا تاکو بەرز ببنەوە بۆ دانانی دیوارەکەو جێگای پێی ئیبراهیم لەسەر ئەوبەردە کەوتوە هەتا ئەم دواییەش هەر ماوە ئیتر ئەوەندە دەستی لێ دراوە ئێستا ساف بوە.

جا ئەو پێیە چۆن لە سەر ئەو بەردە رەقە کاری کردوە ئەگەر هێزو دەسەڵاتی خوا نەبێت؟ دەی ئەم ماڵە بۆجاری دووهەم ئیبراهیم دروستی کردوەو هەموشیان دەڵێن ئیمە لە سەر ئایینی ئیبراهیمین کەچی دژایەتی جێگاو رێگای ئەو پێغەمبەرە بەرێزە دەکەن؟! بە راستی پەیڕەوانی راستەقینەی ئەم سەردەمەی ئیبراهیم ﷵ، محمد ﷺ و یاوەرو پەیڕەوانیەتی و هەر ئەوانن راست دەکەن لە گەل ئیبراهیم دا، ئەوەتە ساڵانە بە میلیونها پەیرەوی ئەو پێغەمبەرە حەج و عومرەو تەوافی ئەو جێگا پیرۆزە دەکەن، لێرەدا هەندێك وتویانە ﴿النَّاس﴾ وشەیەکی گشتیە تایبەت دەکرێت بە موسڵمانانەوە، بەڵام من وای بۆ دەچم کە بە گشتی خۆی بمێنێتەوە ، چونکە پاش هاتنی ئیبراهیم و دروستبونی کەعبە هەمو ئینسانەکان پێویستە لەسەریان کە بچن بۆ حەج و عومرەو موسڵمان ببن، کەوابو کابرای کافریش پرسیاری حەجی لێ دەکرێت هەروەکو چۆن پرسیاری نوێژی لێ دەکرێت، ئاشکرایە مەرجی قەبوڵ بونی حەج و هەر بەندایەتیەکی تر بەسراوە بە بونی ئیمانەوە بە خواو بە پێغەمبەران و بەرۆژی قیامەت. واتە دەبێ هەمو کەس ئیمان

بهێنێتو حەج بكات ئەگینا تاوانبارە مەگەر توانای حەجی نەبێت.

وشەی ﴿ وَمَن كَفَرَ ﴾ دەگونجێت هەر بە مانای كافر بوون بێت بە تایبەتی سەبارەت بەو كەسانەی كە باوەڕیان بە حەج نەبێ، وە دەشگونجێت كوفر ، واتە داپۆشینی راستی. ئینجا دەفەرموێ:

(٩٨) ئەی محمد ﷺ بڵێ بە ئەهلی كتێب بۆچی بێ باوەڕن بە نیشانەكانی خوا؟ خۆ بە راستی خوا شایەتە لە سەر ئەو كردەوانەی كە ئێوە دەیكەن وئاگای لێتانە؟!

(٩٩) پێیان بڵێ: ئەی ئەهلی كتێب بۆئێوە ئەوانەی كەباوەڕیان هێناوە لایاندەدەن لە رێگای خودا كەدەتانەوێ رێگای خودا بە ناشرینی پێشان بدەن لەگەڵ ئەوەشدا كە خۆتان شایەتن لە سەر حەقو راستی ئەو ئایینەی كە محمدﷺ هێناویەتی؟ ئەوسا خوا بێ ئاگا نیە لەوەی كە ئێوە دەیكەن. ئینجا بە ئیمانداران دەفەرموێ:

(١٠٠) ئەی خاوەن باوەڕان ئەگەر ئێوە پەیڕەوی كۆمەڵێك بكەن لەوانەی كەوا ئەهلی كتێبن ئەوانە دڵسۆز نین بۆ ئێوەو هەرگیز رێگای باشتان پیشان نادەن بەڵكو بەپێچەوانەوە ئەوان دەیانەوێ پاش موسڵمان بونتان لە ئایینتان هەڵگەڕێننەوەو كافرتان بكەن. ئا بەم شێوە جوانە خوا ئەهلی كتێبمان پێ دەناسێنێتو دڵپیسی ئەوانمان بۆ رون دەكاتەوە ئیتر بۆ دەبێ ئێمە ئەوەندە گێلوگەمژەبین كە چاوەڕێی خێرۆ چاكە لەوان بكەینو بە دۆستیان بزانین؟ ئەی موسڵمان خۆت مەخەڵەتێنەو خوا نەناسان هەرگیز تۆیان خۆش ناوێو حەز بەخۆشیو بەختەوەری تۆ ناكەنو خۆت شەرمەندەی خوداو بەندە شایستەكانی خوا مەكەو ژیانی دنیا خۆشیەكی كەمەو دواهاتوە.

(١٠١) ئەی ئیمانداران ئێوە چۆن دەبێ بێ باوەڕ ببن لەگەڵ ئەوەشدا كە نیشانەكانی خوادەخوێندرێتەوە بە سەرتاندوا لە ناو ئێوەدایە پێغەمبەرەكەی؟! وە هەر كەسێك كە دەست بگرێت بە ئایینەكەی خواوە بێگومان ئەو كەسە هیدایەت دراوە بۆ سەر رێگای راست. مانای وایە هەر كەسێك دەستی نەگرت بە ئایینەكەی خوداوە ئەوە لە گومڕاهیو بەدبەختیو سەر لێشێواوی دایە، بەڵێ كاتی دابەزینی ئەم قورئانە پێغەمبەر ﷺ خۆی لە ناو ئەواندا بوە بەڵام ئێستا قورئانەكەیو فەرمودەكانی لای ئێمە حازرنو هەروەكو تەشریفی لێرە بێت وایە. دووبارە دەفەرموێ:

(١٠٢) ئەی ئیمانداران هەرچۆنێك شیاوو پێویستە ئاوا لە خوا بترسنو هەر بە موسڵمانیش بمرن. واتە پێویستەبەردەوامبین لەسەرئایینو بێ ئاگا نەبین چونكە نازانین مەرگ كەی دێتو

وَكَيْفَ تَكْفُرُونَ وَأَنتُمْ تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ وَفِيكُمْ رَسُولُهُۥ ۗ وَمَن يَعْتَصِم بِٱللَّهِ فَقَدْ هُدِىَ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ وَٱعْتَصِمُوا۟ بِحَبْلِ ٱللَّهِ جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ۚ وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا ۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠٣﴾ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟ وَٱخْتَلَفُوا۟ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠٥﴾ يَوْمَ تَبْيَضُّ وُجُوهٌ وَتَسْوَدُّ وُجُوهٌ ۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْوَدَّتْ وُجُوهُهُمْ أَكَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿١٠٦﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبْيَضَّتْ وُجُوهُهُمْ فَفِى رَحْمَةِ ٱللَّهِ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١٠٧﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿١٠٨﴾

هەركات لەوانەیە یەخەمان بگرێت، نەوەك لەوكاتە بێ ئاگاییەدا بمرینو رەنجەڕۆببین. وەدەفەرموێ:

(١٠٣) دەست بگرن بە ئایینی خوا وە كە ئاینی ئیسلامەو بەش بەش مەبن، دەست گرتن بە ئاینی خواوە گوریسێكەو هەرگیز نابچڕێت لە راستی دا هەر ئەمە بەسە بۆ ئەوەی موسڵمانان یەكدەستو یەك پارچە بن، چونكە دینەكەی خودا یەكەو نابێ بە دوو، بەڵام بۆ زیاتر بە هێز كردنی ئەو مانایە وشەی ﴿ وَلَا تَفَرَّقُوا۟ ﴾ ی هێنا بە دوادا واتە نەكەن بەش بەش ببن. جا كەوا بو بەش بەشبونو دەستە دەستەییو حزب حزبانە لە ئیسلامدا نیە ئەو كەسانەی كە ئەو جۆرە ئیشانە دەكەنو بە شتێكی رەوای دەزانن بە راستی بە رێگای هەڵەدا دەڕۆنو ئیسلام دورە لەوانەوە، چونكە خوا دەفەرموێ: هەموتان دەست بگرن بە دینەكەی خواوەو بەش بەشنەبنو بیر بكەنەوە لەو نیعمەتە گەورەی خوا كەدەمێك بو ئێوە دوژمنی یەكتر بوون جاخوا پەیوەندیو موحبەتی دروستكرد لە ناو دڵەكانتان دا ئینجا ئێوەیش بە هۆی ئەو نیعمەتەی خوداوە بوون بە برای یەكتر، وەئێوە بە راستی لە لێواری بیرێكی ئاگر دا بونو نزیك بو بكەونە خوارەوە بۆ ناوی ئەوسا بە راستی خوا ئێوەی رزگار كرد لێی دەی كەوابو شوكرو یادی ئەو نیعمەتەی خوا بكەنو زیاتر سورترو بەردەوامتربن لە سەر بەندایەتیو برایەتی. جا دەفەرموێ: هەر ئاوەها خوا نیشانەكانی خۆی بۆ ئێوە رۆشن دەكاتەوە بەڵكو ئێوەش رێگای

وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿١٠٩﴾ كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۚ مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١١٠﴾ لَن يَضُرُّوكُمۡ إِلَّآ أَذٗىۖ وَإِن يُقَٰتِلُوكُمۡ يُوَلُّوكُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾ ضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ إِلَّا بِحَبۡلٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٖ مِّنَ ٱلنَّاسِ وَبَآءُو بِغَضَبٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَسۡكَنَةُۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَيَقۡتُلُونَ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿١١٢﴾ ۞ لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾

هیدایەت بگرنو خۆتان بە ئارەزۆی خۆتان ئەو ڕێبازە بە نرخە هەڵبژێرن.

﴿١٠٤﴾ جا لە ناو ئەو کۆمەڵە موسلمانانەدا کە دەست دەگرن بە ئاینەکەی خوداوە پێویستە کۆمەڵێکی تایبەتیش لە ناو ئەوانەدا هەبێت نەك حیزبێکی تایبەتی کەپاراستنی بەرژەوەندی تەسکی حیزبەکەی بە لاوەپیرۆزتربێت لەپاراستنی موسڵمانان واتە هێزێك کە دڵی موسڵمانان بێتو پاسەوانی ئەوان بکەن لەهەمو بوارێکی ئایین داو خەڵکی بانگ بکەن بۆ ئیسلام، کە ئیسلام هەموی خێرەو تاکە ئیشێکی تێدا نیە کە خێر نەبێتو فەرمان بکەن بە چاکەو بەرگری بکەن لە خراپە، وە بە ڕاستی ئائەوانە ڕزگارن بە پێچەوانەوە ئەگەر وا نەکرا موسڵمانان شەرمەندەو سەر شۆڕ دەبن وەك ئەمرۆ.. دیارە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە بە بێ هێزو دەسەڵات نابێت واتە دەبێ موسڵمانان حکومەتێکی ئیسلامی وایان هەبێت کە ئەم سێ خاڵە بەبێ ترس ئەنجام بدات، ئەگەر ئاوا دەسەڵاتێك نەبێت بەبێگومان هەمو موسڵمانان گوناهبارنو پێویستەلەسەریان کە هەوڵی پەیداکردنی ئەوهێزو دەسەڵاتە بدەن وەك لەم بناغە شەرعیەدا دەڵێت:(**مَا لَا يَتِمُ الوَاجِبُ اِلَّا بِه فَهُوَ وَاجِبٌ**) واتە هەر شتێك بەبێ ئەو واجبێك تەواو نەبێت ، ئەوە ئەوشتە خۆیشی واجبەو دەبێ ئەنجام بدرێت. دەی ئەگەر ئەم ئەرکە گرنگەی ئیسلامەمان ئەنجام دا ئەوە

ئیتر سەر فەرازو بەختەوەری هەردوو دنیاین وەك فەرموی: ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ﴾ جارێکی تر خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿١٠٥﴾ ئێوە وەك ئەو کەسانە مەبن کە بەش بەشبون لە پاش ئەوەی کە بەڵگە گەلێکی ڕونو ئاشکرایان بۆهات، وە بۆ ئەوان هەیە سزایەکی گەورە. کەی ئەو سزا گەورەیە هەیە؟

﴿١٠٦﴾ لەورۆژەدا کە هەندێك لە دەمو چاوەکان سپی دەبێتەوەو هەندێکیش ڕەش دادەگیرسێت، جائەوانەی کە ڕویان ڕەش دەبێت بریتیە لەوانەی کە کافر بوون وپرسیاریان لێ دەکرێت ئایا هەڵگەڕانەوە لەئایین پاش ئەوەی کە باوەردار بون؟ دەی سا بخۆن سزا بە هۆی ئەوەی کە بێ باوەڕ بون. بەڵێ ئەوانە کۆمەڵێکن کە ڕوویان ڕەش دەبێتو شەرمەزاری دەیانگرێت لە ئەو ڕۆژەداو هاوار دەکەنو دەڵێن: خۆزگە دوای پێغەمبەر ﷺ بکەوتینایەو قەپ بە دەستی خۆیاندا دەکەن، جا ئەوانەی کەئەمرۆپشتیان کردوەتە پەروەردگاری خۆیان با بەخۆیاندا بێنەوە بەر لە هاتنی ڕۆژێکی ئاوا سەختو بیربکەنەوەو بگەڕێنەوە بۆلای پەروەردگاری خۆیانو حیسابێك بۆئایندەی خۆیان بکەن پێش ئەوەی کەدادگایی بکرێن:

﴿١٠٧﴾ وە ئەو کۆمەڵەش کە دەمو چاویان ڕۆشنو سپیە ئەوانە وان لە ناو دەریای میهرەبانی خوای خۆیان داو ئەوان بۆ هەمیشە لەو شوێنەدا ئەمێننەوە. جا لێرەدا باش دیقەتی لێ بکەین، چونکە ئێمە لەو دوو کۆمەڵەیە یەکێکیان دەبینو کۆمەڵی سێهەم نیە یان ئەو کۆمەڵە دەبین پەنا بە خوا ڕومان ڕەش دەبێت لە دەرگای خودا چونکە پێغەمبەرێکمان ﷺ بۆ هاتوەو قۆرئانێکی پڕ بەرەکەتی بۆ هێناوینو فەرمودەکانی بە شێوەی ڕاستەقینە لە ناومان دا هەیە، بەڵام ئێمە هیچ گوێیان پێ نادەینو لەو ڕوو ڕەشانە دەبین. یان ئەوەتا بە گوێمان کردوەو لەو ڕو شادو ڕو سپیانە دەبین؟ هیوادارم خوای گەورە لە کۆمەڵی ڕو سپییانمان دابنێت، دیارە ئەمەش بە کردەوەی خۆمان دەبێتو خۆمان دەبێ زەحمەتی بۆ بکێشین، خوداش زوڵم لە کەس ناکات. ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٠٨﴾ ئەی محمد ﷺ ئەمانە ئایەتەکانی خودان کە دەیخوێنینەوە بەسەرتا بە حەقو ڕاستی نەك بە گاڵتەو گەمە، وە خوا نایەوێت زوڵم لە هیچ کەسێك بکات.

﴿١٠٩﴾ جا هەربۆ خوایە ئەوەی کە لە ئاسمانانو زەوی دایەو موڵکی ئەوەو ناتوانین زەرەیەك لەو شتانەی کە اللهُ ئیرادەی نەکردبێت بگۆڕینو ناتوانین قازانج یان زیان بە هیچ کەسێکیش بگەیەنین مەگەر بە ئیزنی خوا بێتو هەموی هەربە خواستو ئیرادەی

خودایەو کاروبار هەر بۆلای ئەو دەبرێتەوە. واتە هەر نیەتو قسەو کردارێك کە دەیکەن پێشەکی لە لای خواوە سەر چاوە دەگرێتو ئەو پێش خۆت بە نیەتو قسەو کردارەکانت دەزانێتو لە پاش مەرگیش ئەوانە هەموی دێنە دادگای خوداو حیسابی لە سەر دەکرێت. ئەوەتە لە سورەتی ملك ئایەتی چواردە دا دەفەرموێ:﴿ئایا ئەو زاتەی کەوردبین‌و زۆر بە ئاگایە نازانێت بەوشتەی کەدروستی دەکات؟﴾

وە لە سورەتی قاف ئایەتی هەژدەدا دەفەرموێ: ﴿هەر قسەیەیەکی لەدەم دەرچێت چاودێری لایە﴾ وە لە سورەتی زوخروف ئایەتی هەشتادا دەفەرموێ: ﴿ئایا ئەوان وا دەزانن کە ئێمە نازانین بە نهێنی و بە چپەکانیان؟ نەخەیر وا نیەو نێرراوی ئێمەیان لایەو دەینوسن﴾ ئەی مرۆڤ ئیتر بەسیەتی لاساری‌و خۆ خەرۆ کردن هەرچی دەکەیت لە سەرت تۆمار دەکرێتو کێشەی یەك یەکت لە گەڵدا دەکرێت حیسابی یەکە بە یەکەی کردەوەکانت لەکەڵدا دەکریت، ئینجا خوای گەورە لە وەسفی چاکانی ئەم ئومەتەدا دەفەرموێ:

(١١٠) ئێوە چاکترین گەلن کەدروستکراون بۆ سودو بەختەوەری خەڵك‌و ئیشەکانتان مایەی سەرفەرازی‌و سەربەرزی خەڵکە. واتە، موسڵمان بۆ خاتری بەرژەوەندی خەڵك ئیش دەکات نەك بۆ سودی شەخسی‌و تایبەتی خۆی، چونکە ئەگەر تەنها بۆ خۆی بێت هەر زیکرو نوێژو رۆژو بەس بوایە هەمو کەسێك دەیتوانی لە ماڵی خۆیدا ئەنجامی بدات، بەڵام خوا بەمە لێمان رازی نابێتو دەبێ کۆمەڵێکی راستمان ببێت هەوڵ بدات بۆ بەرژەوەندی خەڵك‌و بەرژەوەندی خۆی لە بەرژەوەندی گەلدا ببینێتەوە، جا ئومەتی ئیسلامی پێویستە لەسەری هەموی وا بیر بکاتەوە چونکە ئیسلام بە راستی حکومەتی تاکە لە سەر گەل‌و هەمو کەسێك حاکمە و هەمو کەسێکیش تێیدا مەحکومە واتە ئەو کەسەیش کە لە خواروی خوارەوەبێت بۆی هەیە موحاکەمەی رابەر بکاتو بۆی هەیە ئەگەر هەڵەیەکی کرد هەڵەکەی بڵێت ئەوەتە یەك ئافرەت روبەڕوی ئیمامی عومەر دەبێتەوە کاتێك کە مارەیی ژن دیاری دەکاتو پێی دەڵێت: چۆن تۆ مارەیی ژن دیاری دەکەیت؟ خوای گەوە دەفەرموێ: ﴿ئەگەر داتان بە ئافرەتان کۆمەڵە پارەیەك﴾ نیسا/٢٠ تۆ چۆن دەتوانی دیاری بکەیت؟ عومەر وتی: خوایە داوای لێ خۆشبونت لێ دەکەم‌و پاشگەز ئەبێتەوە لە قسەکەی خۆی، ئەوەیە دادپەروەری لە ئیسلام داو حکومەتی ئیسلام کە ئەو ئافرەتە بێ ترس لەو خەلیفە رەخنە دەگرێتو خەلیفەش رەخنەکەی وەردەگرێتو دان بە هەڵەی خۆیدا دەنێت.

جا ئەو وڵاتانەی کە ئەمرۆ هاواری دیموکراسی‌و مافی مرۆڤ ومافی ئافرەت دەکەن با نمونەیەکی وامان پێشان بدەن، بەم شێوەیە دەرکەوت کە حکومەتی ئیسلامی حکومەتی هەمو گەلەو هەرتاکێکی ئەوگەلەدەبێ فەرمانبەرو فەرماندەر بێت وەك دەفەرموێ: ئێوە ئەمر دەکەن بە چاکەو بەرگری دەکەن لە خراپەو ئیمانتان هەیە بە اللّٰه. (واو) تەنها بۆ عەتفەو مانای ئەوە نیە کە دوای ئەمە ئیمانتان ببێت. بەڵام فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە ئەوەندە گرنگو پێویستە بۆیە وای پێشان داوە. بەداخەوە ئەمرۆ ئێمەی موسڵمان نوێژ دەکەین‌و رۆژی دەگرین، بەڵام بە سەدان ئیشی حەرام دەبینین‌و بەرگری لێ ناکەین‌و سەدان ئیشی چاکیش دەزانین‌و نایڵێین‌و خەڵکیشی بۆ بانگ ناکەین ئەمە مانای وایە کە ئێمە راست ناکەین نەلە گەل خواداو نە لەگەل خۆماندا. ئینجا دەفەرموێ: ئەگەر ئەهلی کتێب ئیمان بێنێت بەراستی هەر ئەوە چاکە بۆیان‌و سەرفەرازو سەربەرزی هەردوو ژیان دەبن. بەڵێ لەوانیش هەندێکیان ئیمانیان هێناوە وەك (عەبدوڵای کوڕی سەلام‌و نەجاشی) وە زۆربەیشیان فاسقن‌و لە سنوری خوا ناسی‌و بەندایەتی دەرچون‌و کافرن. ئاشکرایە ئەم کافرو بت پەرستو بێ باوەڕانە هەروا بۆ خۆیان دانانیشن‌و سەری خۆیان کز بکەن بەڵکو هەمیشە خەریکی پیلان نانەوەو سازکردنی بەڵاو سزان بۆ خاوەن باوەڕان‌و بێجگە لەوەش هیچیان پێ ناکرێت بۆیە خوا موژدە دەدات بە موسڵمانان‌و دەفەرموێ:

(١١١) ئەوانە هەرگیز هیچ زیانێکتان لێ نادەن تەنها ئێشو ئازارتان پێدەگەیەنن. واتە ئەوانە هەرچی بکەن هەرئەو ئێش‌و ئازارەیان لە دەست دێتو ئێوە هەر قازانج دەکەن، وە ئەگەر شەڕیشتان لە گەڵدا بکەن سەرەنجام پشتتان تێ دەکەن‌و شکەست دەخۆن لە پاشدا یارمەتیش نادرێن، چونکەخوای گەورە دۆستو سەرپەرشتی ئیمان دارانەو ئەوان هیچ دۆستو سەرپەرشتو یارمەتی دەرێکی راستیان نیە.

(١١٢) چادری زەلیلی هەڵدراوە بە سەر ئەواندا. دیارە ئەمە تایبەت بە جوەکانە لە هەر کوێیدا بىن مەگەر دەست بگرن بە ئاینی خواو موسڵمان ببن‌و پەیڕەوی پێغەمبەرو قورئان بکەن لەم کاتەدا ئیتر هیچ جیاوازی نامێنێت وەکو دەیفەرمو:{فَلَهُمْ مَا لِلْمُهَاجِرِينَ وَعَلَيْهِمْ مَا عَلَى الْمُهَاجِرِينَ / جاچ سودێك بۆ کۆچەریان هەبێت بۆ ئەوانیش هەیە، وە چ زیانێك بۆ کۆچەریان هەبێت بۆ ئەوانیش هەیە}وە یان دەست بگرن بە خەڵکی ترەوە واتە شەرمەندەو سەرشۆڕن مەگەر ببن بە هاوپەیمانی خەڵکانێکی بەهێز تر بێجگە لە خۆیان. جاتەماشا کەن ئێستا جولەکە ئەگەر بە پاڵپشتی ئەمریکاوو ئەو هەمو کفرەوە نەبێت ناتوانێت شەڕ لە گەڵ موسڵماناندا بکاتو خاکی موسڵمانان‌و قیبلەی یەکەمیان

داگیر بکات. ئەمڕۆ دوو شت بوە بە هۆی سەربەرزی جوەکان یەکەمیان: کە گرنگتریانە واز هێنانی موسڵمانانە لە ئایینەکەیان. دووهەمیان: پاڵپشتی کوفری جیهانە لە جولەکە. ئینجا دەفەرموێ: ئەوسا ئەوان کەوتونەتە بەر رقی خوداو فەقیریش دووبارە ئەوانەی گرتۆتەوە.

جا لێرەدا لەوانەیە زۆر کەس بڵێت خۆ ئێستا ئیسرائیل زۆر دەوڵەمەندترە لە وڵاتە بە ناو ئیسلامیەکان کەچی خوا دەفەرموێ: ئیتر تازە ئەوان چادری فەقیری دایگرتوون، بەڵام ئەگەر کەمێك بە چاکی ورد ببینەوە دەزانین کە ئێستاش چەند فەقیرن دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەمڕۆ لەم جیهانەدا دەوڵەتێکی ئیسلامیمان نیە کە یاسای ئیسلام بە رێوە بباتو سامانی وڵات بە شێوەی دادپەروەرانە خەرج بکات جا ئەگەر ئاوا دەوڵەتێکمان بو ئینجا دەبینی ئەو حکومەتی ئیسلامیە چەند دەوڵەمەندەو ئەوان چەند فەقیرن هێشتا لەم حاڵەتەشدا کە ئێمە حکومەتێکی ئیسلامی ئاوەهامان نیەو سامانی وڵاتی ئیسلامی لە زۆر رێگای بێ سودەوە لەناو دەچێت کەچی خەرجی ئێمە لەم وڵاتانەی خۆماندا باشترەو سووکترە تا وڵاتێکی وەکو ئەمریکاو ئیسرائیل بۆ نمونە ئەگەر خواردنی پێنج کەس لەم وڵاتەدا بە سەدوپەنجا دیناری خۆمان تەواو ببێت هەر ئەوخواردنانە لەو وڵاتانەدا بۆ پێنج کەس بە پێنج سەد دینار تەواو نابێت، ئیسرائیل ئەگەر ساڵانە وڵاتێکی وەکو ئەمریکا بە میلیونها دۆلار یارمەتی نەدات هەر زۆر زوو لە ناو دەچێت لە کاتێکدا زیاتر لەو پارەیە سەروەتو سامانی وڵاتانی ئێمەیە لەو وڵاتە کافرانەدا بە ئیشی بێ سود یان کەم سود لە بەین دەچێت کەوابو قسەی خوا راستەو جولەکە چادری زەلیلیو فەقیریان بە سەردا هەڵدراوەو قەت لە سەریان لاناچێت مەگەر بگەڕێنەوە بۆ سەر ئاینە پیرۆزەکەی ئیسلام.

ئینجا جولەکە بۆ وایان لێ هاتوە خۆ ئەوانیش هەر بەندەی خودان بەڵکو بەندەیەکی زۆر زۆر پیرۆزیش بوون لە کاتی خۆیداو ئەولادی یەعقوب پێغەمبەر بوونو خوا بەرزی کردنەوە بە سەر خەڵکی زەمانی خۆیاندا؟ بەڵام ئەوان وازیان لە ئایین هێناو دەستیان دا یە خراپە کاری وەك خوا دەفەرموێ، بۆیە ئەوان ئاوەها کەوتنە بەر تۆڵەو سزای خوای گەورە، چونکە ئەوان بێ باوەڕ بون بە نیشانەکانی خواو چەندین پێغەمبەری خوایان کوشتوە. لە ریوایەتێکدا کە ئیبنو ئەبی حاتەم لە عەبدوڵای کوری مسعودەوە دەیگێڕێتەوە کە لە یەك رۆژدا سێ سەد پێغەمبەریان کوشتوە بۆ ئێوارە دوکانیان داناوە واتە ئەم تاوانە گەورەیەیان بە هیچ دانەناوە، بۆیە ئەمانە وایان بەسەر هات چونکە ئەمانە تاوانیان کردووەو لایان داوە لە ئایینەکەی خوا وە ئەوان تەجاوز کار بوون بۆیە خوای گەورە ئاوای لێ کردنو بۆ هەمیشە چادری رقو قینو تۆڵەی داوە بە سەریاندا، تا پەشیمان نەبنەوە ئەوە بەشیانە، ئەگینا خوا ستەم لە کەس ناکات ئەوەتە لێرەشدا دەفەرموێ:

(١١٣) ئەوان هەمویان وەك یەك نین لە ناوئەهلی کتێب دا هەندێکیان هەن کە شەو نوێژ دەکەنو ئایاتەکانی خوا لە کاتەکانی شەودا دەخوێننەوەو سوجدە دەبەن بۆ خوداو بەندایەتی راستەقینە دەکەن بە شەو تا باشتر خۆیان لە روپامایی بپارێزن، مەبەست لەسوجدە لێرەدا نوێژە بەڵام بە ناوی نزیکترین جێگای بەندە لە خواوە ناوی نوێژی بردوە هەروەك لە فەرمودەی پێغەمبەرمانەوە ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ:{أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ / مسلم/ نزیکترین کاتی بەندە لە خواوە کاتێکە کە بەندە لە سوجدە دا بێت جا زۆر دوعای تێدا بکەن}

چونکە ئەو کاتە شایستەیە بۆ وەرگرتنی دوعاکانتان، ئەوەی کە بە ناوبانگە لە قسەکان ئەوەیە کە ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵای کوڕی سەلامو ئەسەدی کوڕی عوبەیدو سەعلەبەو ئوسەیدی کوڕانی سەعیەو بێجگە لەوانیش دابەزیوە. بەڵێ سەر خستنە سەر زەوی گەورەترین نیشانەی گەردن کەچیو زەلیلی بەندەیە بۆ خوا، چونکە تۆ ئەودەمو چاوەی کەزۆر بەرێزەو بەرزی رادەگریت لە ناو خەڵکدا، لە سوجدەدا ئەودەمو چاوت دەخەیتە سەر خاك بۆ خواو زۆر زەلیلی لە خۆتەوە نیشان دەدەیت،بۆیە لەخوا زۆر نزیك دەبیتەوە. ئینجا خوای گەورە درێژە بە وەسفی ئەم کۆمەڵە چاکە دەداتو دەفەرموێ:

(١١٤) ئەمانە باوەڕ دێنن بە خواو بە رۆژی دواییو فەرمان بە چاکە دەکەنو بەرگری لە خراپە دەکەنو پەلە دەکەن لە ئیشی چاکداو ئەمانە لەپیاو چاکانن. بەم شێوەیە خوای زاناو بە سۆز مرۆڤی چاك لە خراپ جیا دەکاتەوەو تۆڵەی کەس لە کەسێکی تر ناسێنێتو دەفەرموێ:

(١١٥) خۆ ئەوەی کەوا ئەوان دەیکەن لە چاکە با بزانن کەبێ منەت ناکرێتو پوچ ناکرێتەوەو خوایش زانایە بە پەرهیزکارانو پاداشتیان دەداتەوەو رۆزییان پێ دەداتو دەرگای چاکەیان لێ دەکاتەوەو لە تاوانەکانیان خۆش دەبێتو یاسایەکی وایان پێ دەدات کە چاكو ناچاك لە یەك جیا بکەنەوەو ئەبنەخۆشەویستی اللّٰه. ئینجا پاش باسی چاکانو کردارەکانیان باسی خراپە کارانو پاشە رۆژیان دەکاتو دەفەرموێ:

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١٦﴾ مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَأَهۡلَكَتۡهُۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ مِّن دُونِكُمۡ لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَإِذَا خَلَوۡاْ عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١١٩﴾ إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡ وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿١٢٠﴾ وَإِذۡ غَدَوۡتَ مِنۡ أَهۡلِكَ تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٢١﴾

﴿١١٦﴾ بە بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕن هیچ سودێك بەوان نادات لە تۆڵەو سزای خوا نە ماڵیانو نە منداڵیان و ئەوانە ڕەفیقی ئاگرنو ئەوان لەو ئاگرەدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە، چونکە بە کوفرەکەیان دژایەتی خواو هەمو مەخلوقاتی خوا دەکەنو لە هەمو خەیرێك دا تەریکنو لە هەمو شەڕێکدا شەریکن، وە ئەمەش ستەمێکە پێشەکی لە خۆی دەکاتو پاشان لە خەڵك، لە بەر ئەوە ئەگەر ئیشێکی چاکیش بکات هیچی بۆ نانوسرێت وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ:

﴿١١٧﴾ وێنەی ئەوشتانەی کە دەیبەخشن لەم ژیانەی دنیادا وەکو بایەك وایە کە گەرما یان سەرمایەکی زۆری تیادا بێتو بدات لە کێڵگەی گەلێك کە ستەمیان کردوە لە خۆیانو لەناوی ببات، وە خوای گەورە ستەمی لێ نەکردن بەڵکو خۆیان ستەمیا لە خۆیان کرد کە باوەڕیان نەهێنا تا بە کافری مردن.

١ ـ وشەی﴿صِرٌّ﴾ هەندێك بە گەرماو هەندێك بە سەرما تەفسیریان کردوە. واتەبۆ هەردوویان هاتوە.

٢ـ وشەی (رِيحٌ) بە تاکی زۆرتر لە قورئاندا بۆ سزا بە کار هێنراوە وەکو ﴿رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ الأحقاف: ٢٤ ﴿إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ﴿١٩﴾﴾ القمر: ١٩. وە لە هەر کوێدا کۆیە بۆ خۆشیو نیعمەتو ڕەحمەت بە کار هێنراوە وەکو ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦ﴾ الأعراف: ٥٧ یان ﴿وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ﴾ الحجر:٢٢

٣ـ ستەمکارو موشریك بونیان مەترسیەکی گەورەو گرانی هەیە بۆ موسڵمانان بە تایبەتی ئەگەر ئەوان زۆرترو بە دەسەڵات تر بنو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ جَامَعَ الْمُشْرِكَ وَسَكَنَ مَعَهُ فَإِنَّهُ مِثْلُهُ/رواه الترمذي وحسنه الالبا / هەر کەسێك لە گەل موشریکدا کۆ ببێتەوە یان نیشتەجێ بێت لە گەڵیدا ئەوە ئەویش هەروەك ئەو موشریکە وایە}

٤ـ (بِطَانَةً) بە ئەهلی تایبەتی کابرا دەوترێت کە هەمو شتێکی کابرا بزانێت. ئەبو سەعید دەڵێ کە پێغەمبەری خوا فەرمویەتی:{مَا اسْتُخْلِفَ خَلِيفَةٌ إِلا لَهُ بِطَانَتَانِ بِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالْخَيْرِ وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ وَبِطَانَةٌ تَأْمُرُهُ بِالشر وَتَحُضُّهُ عَلَيْهِ وَالْمَعْصُومُ مَنْ عَصَمَ اللَّهُ / البخاري/ خوا هەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێتو هەر جێ نشینێکیش دانرابێت دوو هاوەڵی نهێنی زانی ئەوی پێداوەکە یەکێکیان فەرمانی پێداوە بە چاکە کردنو هەڵیناوە لە سەریو یەکێکی تریان فەرمانی پێداوە بە خراپەو هەڵی ناوە لە سەری وە پارێزراو ئەو کەسەیە کە خودا پاراستویەتی} دووبارە خوای گەورە بانگی ئیمانداران دەکاتو تێمان دەگەیەنێت کە ئێمە دوژمنەکانمان بناسینو دەفەرموێ:

﴿١١٨﴾ ئەی ئیمانداران هەرگیز بێجگە لە خۆتان دۆستی پەنامەکی بۆ خۆتان قەبووڵ مەکەن، واتە کەس نەکەیت بە دۆستی نهێنی بۆ خۆت مەگەر خاوەن باوەڕ بێت، بۆ؟ چونکە ئەوان هەرگیز کۆتایی ناکەن لە خراپە کردنو تێکدانی ژیریو بیرو باوەڕتانو شێت کردنتانو هەمیشە ئاواتە خوازی ئەو شتەن کە دەبێ بە هۆی سزاو تەنگو چەڵمەو ناڕەحەتیتان بە ڕاستی هەندێك جار لە دەمیانەوە ڕقو کینەیان دەردەچێت کە ڕقیان لە ئێوەیە، وە ئەوەی کە دەیشارنەوەو بە ئێوەی ناڵێنو بە نهێنی لەدژی ئێوە ئەنجامیان دەدەن زۆر زۆر گەورەترو پڕ مەترسی ترە لەوەی کە جار بەجار بە دەمیاندا دێت لەدژایەتی کردنتان، جا دەفەرموێ: بە ڕاستی ئێمە ئاوەها نیشانەکانی خۆمانمان ڕۆشن کردووەتەوە بۆتان ئەگەر ئێوەش ژیری بخەنە کارەوەو خۆتان گێل نەکەن دەبێ دۆستودوژمنی خۆتان باش بناسن. جا ئەمە هەڕەشەیەکی گەورەو توندە بەتایبەت بۆ ئەمڕۆی ئێمەو پێویستە بزانین کە دۆستایەتی لە گەڵ کێدا دەکەینو نابێ بخەڵەتێین بە قسەی پوچو بەڵێنی درۆی خوانەناسان، چونکە ئەمانە هەرگیز لە گەل

ئێمەدا راست نین، وە نابێ ئێمە ئەوەندە ساویلکەو نەزان بین.
ئینجا جوانتر پێناسەی خوانەناسمان بۆدەکاتو دەفەرموێ:

(١١٩) ئاگاداربن ئێوە ئا ئەوانەن کە ئەوانتان خۆش دەوێت، بەڵام ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێت، وە ئێوە باوەڕتان بە تەواوی ئەم کتێبە هەیەو هەموی بە راست دەزانن کەچی ئەوان لەو بە گومانن، وە هەر کاتێك بگەن بە ئێوە دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، وە هەر کاتێکیش کە هەرخۆیان تەنیا بنوموسڵمانیان لەناودا نەبێت لە داخدا ئەنگوستی خۆیان دەگەزنو دەڵێن: ئەوانە چینو دەیانەوێ چی بکەن؟! وە سەدان قسەی ناشیرین دەکەن وەکو ئەمڕۆ کابرا خۆی بە موسڵمان ئەزانێت کەچی گاڵتە بە سوننەتی پێغەمبەرﷺ دەکاتو بە نارەوا رەخنە لە خاوەن باوەڕان دەگرێت، ئینجا خوا دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: هەر با بەو داخەوە بمرن بە راستی ﷲ زانایە بەوەی کە لە ناو سینگەکاندا هەیە. ئینجا خوای گەورە سیفەتێکی تری ئەوانمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٢٠) ئەگەر کەمێك شتی چاکتان پێ بگاتوکەمێ بکەونە خۆشیەوە ئەوان نارەحەت دەکات، وە ئەگەر خراپیوبەڵایەك روتان تێ بکات ئەوان بەوەکەیف خۆش دەبن، واتە ئێوە نەك هەر دوچاری چاکەو خۆشی بن بەڵکو هەر تۆزقاڵێك چاکەتان پێ بگات ئەوان پێیان ناخۆشە، جا ئەگەر بکەونە ناوچاکەوە بە راستی ئەوان هەر لەوانەیە لەت لەت ببن لە خەمدا، بەڵام بەڵاو موسیبەتتان هەرچەند زۆرتربێت ئەوان خۆشحاڵ تردەبن، ئینجا خوا دڵی خاوەن باوەڕان دەداتەوەو دەفەرموێ: خۆ ئەگەر ئێوە سەبرتان ببێتو تەقواتان هەبێت فڕوفێڵی ئەوان هیچ زیانێکتان پێ ناگەیەنێت. بەراستی ئەم دوو وشەیە زۆر پیرۆزنو سارێژ کەری هەمو ئێشو ژانو برینێکنو هۆی سەرکەوتنو پیرۆزی موسڵمانانە لە هەمو شەڕێکدا چ شەڕی شەیتانو نەفس بێتو چ شەڕی کوفرو تاغوتو تاغوت پەرستان بێت، بەڵێ ئەگەر بەم دوو وەسفەوە موسڵمانان خۆیان لکاند بە بەرنامەو فەرمانەکانی خواوە دوژمنانیان خۆیان پێ ناگیرێتو بە زویی تارو مار دەکرێن، چونکە ئەوان سەرشۆڕو زەلیلن لە بەر دەستی خوادا، ئەوەتە دەفەرموێ: بەبێگومان کە ﷲ ئاگادارە بەوەی کە ئەوان دەیکەنو بەهێزو دەسەڵاتو زانیاری خۆی چوار دەوری داونو لە کاتی پێویستدا دێت بە هاواری خاوەن باوەڕانەوەو دەیان پارێزێت دوژمنانیان سەرشۆڕو ریسوادەکات، ئینجا خوای گەورە لە ئایەتی سەدو بیستو یەك بەولاوە تا کۆتایی ئەم سورەتە بەدرێژی باسی شەڕی ئوحود دەکات. جابۆ ئەوەی جوانتر لە ئایەتەکان شارەزابین کورتەیەکی ئەو غەزایەتان بۆ باس دەکەین، دەگێڕنەوە لەمبارەوە پرسیارکرا لە عەبدورەحمانی کوڕی عەوف کەدەنگو باسی جەنگی ئوحود چۆن بوە وتی: پاش ئایەتی سەدوبیستو یەکی ئالی عیمران بخوێنەرەوە دەنگو باست دەست دەکەوێت، قورەیش کە شکستی غەزای بەدرو تیاچونی دەیان پیاوی ناوداریان، بوو بە داخو سەرشۆڕیان، بڕیاریاندا سوپایەکی بە هێز بۆ تۆڵە سەندنەوە لە موسڵمانان رێکبخن جا ئەوەبو لە مانگی شەوالی ساڵی سێهەمی کۆچیدا بۆ سڕینەوەی ئەو نەنگو سەرشۆڕیەی ساڵی بەدر سێ هەزار کەس بە فەرماندەیی ئەبو سوفیان بەرەو مەدینە کەوتنە رێو خێڵەکانی دەوروبەری مەکەیش هاوکاریان کردنو ئەبوعەمری راهیبیش کە خەڵکی مەدینەو لە تیرەی ئەوس بو لە دژی پێغەمبەر ﷺ رایکردبوە ناو قورەیشیەکانو پێغەمبەر ﷺ ناوی نابو ئەبو عەمری فاسق لە گەڵیانو سەفوانی کوڕی ئومەییە بە ئەبو عوزەی شاعیر وت: تۆ شاعیرو زمان لوسی دەبێ بە قسەو هەڵبەست یارمەتیمان بدەیت وتی: من پەیمانم داوە بە محمد ﷺ کە لە دژی نەدوێم دەترسێم ئەم جارە بکەومەوە بەر دەستیو رزگارم نابێت. وازی لێ نەهێنا تا لە گەل خۆی دا بردیو ژنانی قورەیش بە سەرۆکایەتی "هیندی کچی عوتبە کە خێزانی ئەبو سوفیان" بو سور بون لە سەر ئەوە کە بچن لە گەلیانداو هاوبەشی شەڕەکە بکەن پیاوەکانیان لەم بارەوە کەوتنە مشتو مڕ، هەندێکیان بردنیان بە لاوە چاك بو چونکە ئەوان باشتر دەتوانن پیاوان هەڵبنێنو کوژراوەکانیان بخەنەوە بیرو هەندێکی تریان ئەم بۆچونەیان بەلاوە پەسند نەبو "هند" هاتە زمانو قیژاندیو وتی: ئێوە لە رۆژی بەدردا خۆتان دەرکردو هاتنەوە باخەڵی ژنەکانتان! بەڵێ ئێمە دێینو بە قسەی کەسیش ناگەڕێینەوە جا ئەو سوپای سێ هەزار کەسیە بە ژنانەوە هاتنو سەرپەرشتی ژنان بە دەست هندەوە بو کە لە بەدردا عوتبەی باوکیو وەلیدی برایو شەیبە مامیو حەمزەلەی کوڕی کوژرابون ئەو ساڵە نە خۆیو نە ئەبو سوفیانی مێردی ئاویان لە لەشیان نەدابو نەشگریا بون بۆ کوژراوەکانیانو سوێندی تۆڵە سەندنەوەیان خواردبو، ئەو لەشکەرە دووسەد ئەسپو سێ هەزار وشترو حەوت سەد زرێی جەنگیان پێ بو، ئاڵای گەورەیان بە دەست تەلحەی کوڕی ئەبو تەلحەوە بو هەر لە کاتی رێکەوتنی ئەو سوپایە عەباسی مامی پێغەمبەر کە هێشتا موسڵمان نەبو بو لە بەر خزمایەتی نامەیەکی نوسی بۆ پێغەمبەرو هەمو شتێکی ئەو سوپایەی بۆ نوسیو بە پیاوێکی غەفاری دا بۆی ناردو پێی وت: کە لە ماوەی سێ رۆژدا بیگەیەنێت بە پێغەمبەر ﷺ لەشکر گەیشتە چیای ئوحودو نامە بە پێغەمبەر ﷺ گەیشت پێشەکی ویستی جارێ کەس نەزانێ چوە ماڵی (سەعدی کوڕی رو بەیع)و روداوەکەی بۆ باس کردو فەرموشی با جارێ کەس نەزانێت، بەڵام

ژنی سەعد زانیو کارەکە بە نهێنی نەمایەوە، پێغەمبەر ﷺ ئەنەسو موئنیسی کوڕی فەزالەی نارد بۆ هەواڵ زانینی قورەیشیەکانو بینیان وا نزیك بونەتەوەو وڵاخو حوشترەکانیان بەرەڵای ناو کشتوکاڵی مەدینە کرد وەو بە دوای ئەوانیشدا (حباب ی کوری مونزر)یشی نارد هەمو هاتنەوەو هەواڵیان دایە وەکو (عباس) نوسیبوی پێغەمبەرمان ﷺ کەوتە بیر کردنەوە هەر لەو کاتەدا سەلمەی کوری سەلامە چوە دەرەوەی شارو دیتی وا خەریکە دێنە ناو شارو بە گورجی گەڕایەوەو هەواڵی بە مەدینەییەکان داو خەڵکی مەترسیەکی زۆریان پەیدا کردو موسوڵمانان شەو لە مزگەوتا بە چەکەوە دەمانەوەو کۆمەڵێکیش کە سەعدی کوڕی مەعازو ئوسەیدی کوڕی حوزەیرو سەعدی کوڕی عوبادەیان تێدا بو بە چەکەوە بە شەو چاودێری پێغەمبەریان دەکردو لە سەر هەمو ڕێگای چونە ناو مەدینە چاودێریان داناو چەند کەسانێکیش دەگەڕان بە سەر ئەو ڕێگایانەدا کە دەگونجا لەو شوێنانەوە دوژمن بێتە ناو شارو پێغەمبەریش گەورە پیاوانو لێزانانی مەدینەی کۆ کردەوەو پرسو رای پێ کردنو خۆی رەئی وابو کە بمێننەوە لە ناو شارداو پارێزگاری لە شار بکەنو زۆربەی پیاوە بە تەمەنو تەجرەبە دیوەکان ئەم بۆچونەیان بە لاوە چاك بو سەرۆکی دوورووەکان (عەبدوڵای کوڕی سلول) هەر ئەم رەئیەی بو، بەڵام گەنجەکانو ئەوانەی کە لە شەڕی بەدرا نەبون بە تایبەت پاڵەوانی بە جەرگ حەمزەی مامی پێغەمبەر کە وتی: سوێند بەو کەسەی کەوا ئەم کتێبەی ناردوە بۆ تۆ من هیچ خواردنێك ناخۆم هەتا بەم شمشێرەی خۆم لە دەرەوەی شار شەڕیان لە گەڵدا نەکەم. لێرەدا پێغەمبەرمان ﷺ کاتێ دی کەرەئی ئەوانەی کە شەڕی دەرەوەی شاریان بە لاوە چاکە زۆرترە، پەسەندی کردو فەرموی: من دەترسم لە شکانو کەوتەڕێ کە ڕۆژی هەینیو دەهەمی مانگ بو خوتبەی جومعەی بۆ خوێندنەوەو وتارێکی جوا نو پڕ تامو پاڵ پێوە نەری فیداکاری ئاراستە کردنو داوای سەبرو ئارام گرتنی لێ کردنو پاش نوێژی عەسر چووە ماڵەوە بۆ ژووری خاتون عائیشەو خۆی گورج کردەوەو زرێی کردە بەرو شمشێری کردە ملو هاتەوە بۆ ناویانو فەرموی: {سەرردەکەون بە مەرجێ کەسەبرو ئارامتان ببێت} بەڵام کاتێ کە پێغەمبەر ﷺ چوو بۆ ماڵەوە ئەوانەی کە رەئیان لە سەر چونە دەرەوە نەبو لۆمەی ئەوانی تریان کردو وتیان: بە خوا ئێو خۆتان دەزانن کە پێغەمبەر ﷺ پێی خۆشبو کە لە شاردا بمێنینەوە بەڵام ئێوە ناچارتان کرد بە دەرچون جا مادام ئەو نارازی بێت سەرناکەونو خراپتان کرد کە رەئیەکەی ئەوتان شکاند، ئێستەش ئێو ئیشەکە بخەنە دەست خۆیو گوێ رایەڵی بن با خۆی بڕیار بدات ئەوانیش دڵیان نەرم بوو لە سەرەنجامی کارەکە ترسانو پەشیمان بونەوە کە پێغەمبەر ﷺ هاتە دەرو زرێو شمشێری بەست بو ئەو کۆمەڵە بەرەو رووی رۆینو پێیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە نامانەوێ پێچەوانەی فەرمانی تۆ بجولێینەوە تۆ خۆت چی بە باش دەزانیت وەها بکەو ئێمە گوێ رایەڵیت دەکەین ئیشەکە بە دەست خواو بە دەستی تۆیە پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: {من وام وت لە پێشەوە ئێوە نەتان بیست تازە تێپەری، پێغەمبەر کە چەکی هەڵگرت ئیتر بۆی رەوا نیە کەدایبنێت تا خوا فەرمانی خۆی جێ بە جێ نەکات لە نێوان ئەوو دوژمنەکانی دا} ئینجا پێغەمبەر ﷺ لەشکرەکەی کرد بە سێ بەشەوە

١. بەشی کۆچکەرانو ئاڵاکەیانی دا بە مەسعەبی کوڕی عومەیر.

٢. بەشی ئەوسی لە یارمەتی دەرانو ئاڵاکەیانی دا بە ئوسەیدی کوڕی حوزەیر.

٣. بەشی خەزرەجیو ئاڵاکەیانی دا بە حەبابی کوڕی مونزیر ئەو لەشکرەش پێك هاتبوو لە هەزار جەنگاوەر کەسەد زرێیان پێ بو هەروەها دوو ئەسپ کەیەکێکیان هی پێغەمبەر بو، وە ئەوی تریان هی ئەبو بەردە بو عەبدوڵای کوڕی ئومومەکتومی دانا بۆ نوێژ کردن بۆ ئەوانەی کە لە مەدینە دا مانەوە ئینجا لەشکر بەرەو باکور کەوتە ڕێگاو هەردوو سەعدەکان لە پێش پێغەمبەر ﷺ وە بوون کە خۆیان تەتەر پێچ کردبوو لەو کاتەدا پێغەمبەرمانﷺ چاوی بە کۆمەڵێکی تر کەوت کە جوان خۆیان پێچاوەو لەم سێ کۆمەڵەش نین فەرموی: ئەوانە کێن؟ وتیان: ئەوە جوولەکەکانی خەزرەجنو دەیانەوێت لەم شەڕەدا بەشداری بکەن پێغەمبەر فەرموی: ئایا موسڵمان بوون؟ وتیان: نەخێر فەرموی: {نابێ یارمەتی وەرگرین لە کافر دژی موشریك}و ئینجا گەیشتنە جێگایەك کە پێی دەوترا (شەیخان) سەردانێکی لەشکرەکەی کردو هەرچی مناڵ بوو هێزی شەڕ کردنی تیادا نەدیت گەڕاندیەوە لەوانە عەبدوڵای کوڕی عومەرو ئوسامەی کوڕی زەیدو زەیدی کوڕی سابیتو زەیدی کوڕی ئەرقەمو عەرابەی کوری ئەوسو عەمری کوری حەزمو ئەبو سەعیدی خدریو زەیدی کوڕی حاریسەی ئەنساریو سەعدی کوڕی حەببە. ڕێگای بە رافع ی کوڕی خەدیجو سەمورەی کوڕی جوندوب دا هەرچەند کە مناڵ بون، چونکە رافع تیر ئەندازێکی چاك بو سەمورەش وتی: من بە هێزترم لە رافعو دەتوانم ئەو بدەم بە زەوی دا کاتێ کە ئەو هەواڵە بە پێغەمبەر درا فەرمانی پێ دا کە لە بەر چاویدا زۆران بگرن زۆرانیان گرت سەمورە رافع ی خستە ژێر پێغەمبەرﷺ بەویش ڕێگای ئەو جەنگەی دا لە هەمان شوێن دا شەویان بە سەردا هاتو نوێژی مەغریبو لە پاشدا عیشای کردوو پەنجا کەسی هەڵبژارد بۆ پاسەوانی لەشکرەکە بە

إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ أَن تَفۡشَلَا وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ﴿١٢٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ وَلِتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦۗ وَمَا ٱلنَّصۡرُ إِلَّا مِنۡ عِندِ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١٢٦﴾ لِيَقۡطَعَ طَرَفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَوۡ يَكۡبِتَهُمۡ فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾ لَيۡسَ لَكَ مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٌ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡ أَوۡ يُعَذِّبَهُمۡ فَإِنَّهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٢٨﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضۡعَٰفٗا مُّضَٰعَفَةٗۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿١٣٢﴾

سەرپەرستی (موحەممەدی کوڕی مەسلمە) ی ئەنساریو زەکەوانی کوڕی عەبدو قەیسیش سەرپەرشتی پاسەوانی پێغەمبەری گرتە ئەستۆ جا قورئان ئەم ئامادەکردنەی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٢١﴾ ئەی محمد ﷺ باس بکە ئەو بەیانیەی کە لە ناو خاو خێزانی خۆتا دەرچوویتو خاوەن باوەڕانت ئامادە دەکرد بۆ جەنگو ڕێکو پێکت دەکردن، وە خوا بیسەری قسەی تۆو دوژمنانتو دەزانێت کام ڕاست دەڵێنو لە سەر ڕاستنو کام فرو فیشاڵ دەکەنو لە سەر بەرنامەیەکی بەتاڵن. بۆ بەیانی کەمێ شەوی مابو بەرەو دوژمن کەوتە ڕێگاو لە ناوچەی (شەوت) دا بو نوێژی بەیانی کردو زۆر نزیك بونەوە لە دوژمن لەو کاتەدا سەرۆکی منافقان (عبدالله) ی کوڕی ئۆبەی بە بەهانەی ئەوەوە کەکاتی پرسو ڕاکە پێغەمبەر ﷺ بە گوێی نەکردوم سێ سەد جەنگاوەری لە گەل خۆیدا گەڕاندەوە بێگومان ئەو مەبەستی ئەو بە گوێ نەکردنە نەبو، چونکە ئەگەر وا بو دەی بۆچی هات تا ئەو جێگایە بەڵکو مەبەستی ئەو لەو جێگادا لاواز کردنی ڕوحییەی موسڵمانان بو لەو لایشەوە ئەبو بە هۆی بە هێز کردنی دوژمنی داخ لە دڵ دژی پێغەمبەر ﷺ بەڵێ ئەو موناففە لە پیلانەکەیدا هەندێ سوودی خۆی دەست کەوت ئەوە بو دوو تیرەیش لە موسڵمانەکان خەریك بو ڕابکەنو دوچاری سزای قیامەتو شەرمەندەیی دنیا ببن بەڵام خوا ڕاستیو دڵسۆزی ئەوانی دەزانی دڵ گەرمی کردنو لەو بۆ چونە پاراستنی وەك دەفەرموێ:

﴿١٢٢﴾ باس بکە بۆیان ئەو کاتەی کە دوو تیرە لەخۆتان ویستیان ڕابکەنو مەیدانی جەنگ بە جێ بهێڵن لە ترسا بەڵام خوا دۆستو یارمەتی دەری ئەوان بو پاراستنی لەو نەنگیو سەرشۆڕیە، خۆ هەربەخوا پشت دەبەستن خاوەن باوەڕان. ئینجا بۆ ئەوەی بزانن بەرزیو نزمیو سەرکەوتنو ژێر کەوتن بە دەست خوایە دەفەرموێ:

﴿١٢٣﴾ جا بە ڕاستی خوا یارمەتی ئێوەی داو سەریخستن لە بەدردا لە گەل ئەوەشدا کە ئێوە کەم هێزو کەمدەست بون ئەوسا لە خوا بترسن، بەڵکو ئێوەش سوپاسگوزاربن. واتە هەر چونێك لەوێدا بەو هێزە کەمەوە سەرم خستن بە سەر ئەو هێزە زۆرەدا ئەگەر لە خوا بترسنو سوپاسی نیعمەتی خوا بکەن هەر ئاوەها لێرەش سەرتان دەخەم. ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٢٤﴾ وەبیر بێنەوە ئەوکاتەی کەتۆ بە ئیماندارانت وت: ئایا بەس نیە بۆ ئێوە کەپەروەردگارتان بە سێ هەزار فریشتەی ڕەوانە کراو یارمەتی تان بدات؟

﴿١٢٥﴾ ئەرێ بێگومان وایە کە خوای گەورە یارمەتی موسڵمانان دەداتو دێت بە هانایانەوە ئەگەر ئەوان خۆ بگرن لە بەرامبەر دوژمنەکانەوەو خۆشیان بپارێزن لە تاوان، واتە ئەم دوو مەرجە پێویستە لە سەر موسڵمانان، ئینجا خوا دێت بە هانایانەوەو کوتوپڕ لە دژی ئەوان لەو کاتەدا پەروەردگارتان یارمەتی تان دەدات بە پێنج هەزار فریشتە کە ئەو فریشتانە دیاری کراونو بە تیرەکانیان دوژمنەکانی خودا دیاری دەکەن. ﴿مُسَوِّمِينَ﴾ بەسەرو بەژێر خوێندنەوی واوەکە دروستە. مانەکەیشمان هەر بەوتەرتیبەکردوە، بەڵێ فریشتەکان لە بەدردا هاتنو شەڕیشیان کرد، بەڵام لە هیچ شوێنێکی تردا شەڕیان نەکرد بەتایبەت لەم غەزایەدا ئەوەش لەبەرسێ هۆ **یەکەم**: موسڵمانان لێرە وەك بەدر خۆگر نەبون. **دووهەم**: هەندێکیان دەسکەوتی دنیاییان ویست. **سێهەم**: فەرمانی پێغەمبەریان شکاند. خوالەهەمویان خۆش بێ.

﴿١٢٦﴾ لەراستیدا ئەوفریشتانە دەوریان دووشت بو **یەکەم**: موژدەی ڕاستیو دروستی ڕێبازەکەتانن کە ئیسلامە.

**دووهەم**: تا دڵەکانتان ئارام بگرێتو بە دڵنیاییەوە شەڕ بکەنو لە ژمارەو هێزی دوژمن نەترسنو بزانن سەرکەوتن هەر بە دەست خوایە وەك دەفەرموێ: وە سەرکەوتن نیە مەگەر لە لایەن خواوە بێت واتە فریشتە ناتوانن ئێوە سەر بخەنو ئەبێ دڵی خۆتان بە خواوە ببەستنو خۆ بگرنو لەو بترسن بەڵکو خوا

سەرتان بخات، چونکە خوا یە خاوەن دەسەڵاتەو دانایە لە ئیشەکانیدا. بەڵێ دوژمنانی خواو موسڵمانان هەرگیز ئامادە نین بێ دەنگ بژین لە گەڵ موسلماناناداو هەمیشە شەڕو کارەساتی دڵ تەزێنیان بۆ دروست دەکەن بۆیە خوایش فەرمانی شەڕ دەداتو دەفەرموێ:

(١٢٧) تابەم غەزایە هێزێك لەو كافرانە ببچڕن یان كارێكیان پێ بكەن كە ترسێكی وا بخەنە ناو دڵیانەوە كە ئیتر نەتوانن لە بەرامبەرتانەوە رابوستنو ئارەزۆی شەڕو خراپەكێڵی نەكەنو بە سەرشۆڕیو شەرمەزاری بگەڕێنەوە. بە داخەوە لەغەزای ئوحوددا لە بەر ئەوسێ هۆیەی كە باسمانكرد موسڵمانان دوچاری بەڵایەكی گەورەو گران بوونو حەفتا كەس لە موسڵمانان شەهید بو كە حەمزەی مامی پێغەمبەرمان یەكێك بو لەوانەو پێغەمبەرمان ﷺ بریندار بوو یەكێك لەددانە چوارینەكەی پێشەوەی شكاو توڕە بووهەڕەشەی تۆڵە سەندنەوەی كرد، جا خوا فەرموی:

(١٢٨) لەم بارەیەوە تۆ هیچ شتێكت بۆ نیە یان تۆبەیان لێ قەبوڵ بكەیت یان سزایان بدەیت سا بە راستی ئەوان زوڵمیان كردوە لە خۆیان. واتە تۆ تەنها پێغەمبەرێكیو پەیام دەگەیەنی بە دەستی خۆمانە چی لەوانە بكەینو كەی؟

(١٢٩) ئەوەی كە لە ئاسمانانو زەویدایە بە گیاندارو بێ گیانەوە هەموی موڵكی خوایە. هەر خۆی دەزانێ كەچون رەفتاریان لە گەڵدا دەكات خۆش دەبێت لەو كەسەی كە ئارەزۆی لێیەو رێگای هیدایەت دەگرێت، وە سزا دەدات ئەو كەسەی كە ئارەزۆی لێیەو رێگای خراپ دەگرێتو تاوان دەكات، خوای گەورە خوایەكی بە رەحم ومیهرەبانە بە تایبەت بەرامبەر بە ئینسانەكان. ئینجا خوای گەورە باسی سوخۆری ئەكات كە لە رواڵەتا هیچ پەیوەندیەكی بەم باسەوە نیە بەڵام لە راستی دا قورئان هەمو ئایەتەكانی تێهەڵكێشی یەكترنو پەیوەندی بە هێزیان هەیە بە یەكەوە چ ئێمە بزانین بەو پەیوەندیانە یان نەزانین، وە ئەو پەیوەندیانە كە هەیە لە نێوان ئایەتەكان دا یەكو دوان نیە جا دەگونجێ هەر زانایەك یەك یا دوو یان زیاتر لەو پەیوەندیانە باس بكات، وە زانایەكی تر هەر بەو چەشنە یەكو دوان زیاتر باس بكاتو قسەكانیان لە یەك جیا بێت ئەمە بەڵگەی هەڵەو بۆچونی ئەم زاناو ئەو زانا نیە بەڵكو بەڵگەی بوونی چەندین پەیوەندیە لە نێوان ئایەتەكانی قورئان دا لەوانە:

١ـ هەمویان فەرمودەی خوداندودەبێ بە یەك چاو تەماشا بكرێنو جیاكردنەوەی بەشێكی لەبەشێكی تری تاوانە.

٢ـ رۆشن كردنەوەی ئایەتەكانی خودایە بۆ بەندەكانی.

٣ـ فەرمانی خودایەو پێویستە جێ بەجێ بكرێت.

٤ـ بەرگری خودایەو ئەبێ خاوەن باوەڕان دوور بكەونەوە لەو شتانە كە باس دەكرێن ئەمانە شتانێكی گشتینو دەبنە هۆی پەیوەندی لە نێوان ئایەتەكانی قورئان دا وەهەندێ جاریش سەرەڕای ئەو پەیوەندیە گشتیانە پەیوەندی تایبەتیش هەیە جا ئەگەر پەیوەندییە تایبەتیەكەمان نەزانی كە بێگومان هەیە خۆ پەیوەندییە گشتیەكان هەیە كەواتە قورئان هیچی نیە كە پەیوەندی بە یەكەوە نەبێت كە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە ئەم قورئانە قسەی خوایە ئەگینا دەبو هەندێ دژی هەندێكی تری ببوایە وەكو لە سورەتی نیسا /٨٢ دا دەفەرموێ: ﴿ ئایا وورد نابنەوە لە قورئان بە راستی ئەگەر لە خواوە نەبوایە قسەی دژو پێچەوانەی زۆرتان تێدا بەدی دەكرد﴾ ئینجا دێینەوە سەر مەبەستی خۆمانو ئێرە كە پەیوەندی ئایەتی سوخۆری لەگەل ئایەتی جیهاد دا، ئاشكرایە كە لە پەیوەندیە گشتیەكاندا هاوبەشن كە هەمویان فەرمودەی خودان و بریاری ئەو زاتەیەو پێویستە ئەنجام بدرێن، وە لە پەیوەندیە تایبەتیەكانیش

١ـ سوخۆر بەماڵی خۆی رازی نیە بەڵكو دەیەوێت خوێنی خەڵكیش بمژێت بۆ خۆی ئەوەندە پیسكەو ماڵ خۆشەویستە جا كەسێ كە ئامادە نیە ماڵ بدات لە رێگای خوادا چۆن گیانی فیدای خودا دەكات؟

٢ـ سەركەوتنی موسڵمانان بەستراوە بە دوو شتەوە **یەكەم**: خۆگری لە بەرامبەر دوژمنەوە. **دوهەم**: ترسان لە خواو خۆپاراستن لە تاوان دەی سوخۆری تاوانێكی زۆر گەورەیەو موسڵمانی راستو دروست نابێ بیخوات، چونكە بێجگە لە تاوانەكەی خۆی دەبێ بە هۆی شكستیش لە جیهاد دا، چونكە سوخۆری بانگەوازی شەڕ كردنە لە گەڵ خوادا وەك لەسورەتی بەقەرە ئایەتی (٢٧٨_٢٧٩) دا فەرموی:﴿ لە خوا بترسن ئەی خاوەن باوەڕانو واز بێنن لە سوخۆری ئەگەر باوەڕ دارن جا ئەگەر وازتان نەهێنا دەی بانگەوازی شەڕ بكەن دژی خواو پێغەمبەرەكەی﴾

دەی كەسێك شەڕی خواوپێغەمبەر بكات غەزا دەكات بۆ خوا؟ جا دەفەرموێ:

(١٣٠) ئەی ئیمانداران هەرگیز سوو نەخۆن بە چەند قات كردنەوە ولە خوا بترسن بەڵكو ئێوە رزگار ببن. مانای وانیە ئەگەرچەند بەرامبەر نەبو حەرام نیە بەڵكو دیرهەمێكیش زیاد لەقەرزەكە بێت هەر حەرامەو تاوانە بەڵام زۆربەی چەند بەرامبەر دەبێتەوە بۆیە لێرەوای فەرموە ئینجا دەفەرموێ:

(١٣١) خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی كە ئامادە كراوە بۆ كافران واتە سوخۆری كابرا دەباتە ریزی كافرانەوە. ئینجا دەفەرموێ:

۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿١٣٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿١٣٦﴾ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٣٧﴾ هَٰذَا بَيَانٞ لِّلنَّاسِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٞ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾ وَلَا تَهِنُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَنتُمُ ٱلۡأَعۡلَوۡنَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ إِن يَمۡسَسۡكُمۡ قَرۡحٞ فَقَدۡ مَسَّ ٱلۡقَوۡمَ قَرۡحٞ مِّثۡلُهُۥۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيۡنَ ٱلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَتَّخِذَ مِنكُمۡ شُهَدَآءَۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٠﴾

(١٣٢) گوێ رایەڵی خواو پێغەمبەرﷺ بن‌و فەرمانەکانی جێ بە جێ بکەن تا خوای گەورە رەحمتان پێ بکات. واتە ئەو شتەی کە ئەبێتە هۆی رەحم‌و سۆزی خوا بریتیە لە پەیڕەوی کردنی خواو پێغەمبەر ﷺ. ئینجا خوای گەورە بەرەو خۆشبەختی‌و کامەرانی بانگمان دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٣) دەی پەلە بکەن بۆ لێ خۆشبون لە لایەنی پەروەردگارتانەوە کە ئەویش بە کردارو وتاری چاك دەبێت، وە بۆ بەهەشتێك کە پانایيەکەی بە ئەندازەی ئاسمانان‌و زەویە کە ئەمە ئامادە کراوە بۆ پەرهیزکاران. هەروەك فەرموێ: خۆتان بپارێزن لە ئاگرێ کەئامادەکراوەبۆکافران. ئەمەش بەلگەیە لە سەر ئەوەی کە بەهەشت‌و جەهەنم دروستکراون‌و ئامادە کراون. وە باغەکانی بەهەشت بە وتنی:( **سُبْحَانَ اللهِ وَالْحَمْدُ لِلهِ وَلا إِلَه إِلا اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ**) سەوز دەبێت وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{**لَقِيتُ إِبَرَاهِيمَ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي فَقَالَ يَا مُحَمدُ أَقْرِئْ أُمَتَكَ مِني السلامَ وَأَخْبِرْهُمْ أن الجَنةَ طَيبَةُ التُّرْبَةِ عَذْبَةُ المَاءِ وَأَنهَا قِيعَانٌ وَأن غِرَاسَهَا سُبْحَانَ اللهِ وَالحَمْدُ لِلهِ وَلا إِلَهَ إِلا اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ**} / الترمذی، حسنه الالبا / شەوی ئیسرا گەیشتم بە ئیبراهیم ﷺ وتی ئەی محمد لەمنەوەسەلام بکە لەئومەتەکەت‌و پێیان راگەیەنە کە بێگومان بەهەشت خاکەکەی پاکەوئاوەکەی شیرینەو بێشك کەدەشتێکی کاکی بەکاکییەو بێگومان کە درەختە رواوەکانی ئەوزیکرانەیە(**سُبْحَانَ اللهِ وَالحَمْدُ لِلهِ وَلا إِلَهَ إِلا اللهُ وَاللهُ أَكْبَرُ**)}ئینجا خوا باسی ئەو موتەقیانە دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٤) ئەوکەسانەن کە لە حاڵەتی خۆشی‌و نەخۆشیداو دەسەڵات‌و کەم دەسەڵاتی دا هەر کەس بە گوێرەی خۆی دەبەخشێت‌و رقی خۆیان دەخۆنەوە کاتێك رقیان هەڵدەستێت چونکە رق هەستان لە شەیتانەوەیەو پێویستە خاوەن باوەڕان رقی خۆیان بخۆنەوە، وە ئەوکەسانەن کە خەڵکی عەفو دەکەن وچاوپۆشی لەهەڵەکانیان دەکەن کەئەمانە چاکە کارن‌و خوایش چاکە کارانی خۆش دەوێت. ئەو کەسەی کە چاکە کارە کەسێکە کە ماڵی خۆی لە رێگای خوادا لە هەمو حاڵەتێکدا بەگوێرەی توانای دەبەخشێت‌و رقی خۆی دەخواتەوەو خەڵکی عەفو دەکات لە بەر خاتری خوای گەورە دیارە ئەو کابرایە خوای خۆی بەچاکی دەناسێت‌و پێی وایە کەهەمیشە خوا دەیبینێت کەوابو ئەو کابرایە بوە بە چاکە کار. ئەبو هورەیرە دەڵێت پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:{**لَيْسَ الشَدِيدُ بِالصرَعَةِ إِنمَا الشَدِيدُ الذِي يَمْلِكُ نَفْسَهُ عِنْدَ الغَضَبِ**/ متفق علية/بە هێز ئەو کەسە نیە کە خەڵکی بەزۆران بازی بدات بە زەویدا بەڵکو بە هێز ئەو کەسەیە کە خۆی بگرێت لە کاتی رق هەستان دا} پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{**مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ وَمَا زَادَ اللهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إِلا عِزا وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلهِ إِلا رَفَعَهُ اللهُ**/ مسلم وغ ه/ سێ شت هەیە سوێندیان لە سەر دەخۆم کەوایە یەکەم: هیچ ماڵێك بە چاکە کردن کەم نابێتەوەو خودا هیچ لەبەندەیەکی زیاد ناکات کە چاوپۆشی لە خەڵك بکات‌و رق‌و قینی خۆی بخواتەوە مەگەر زیاتر بە هێزتری بکات، وە هەر کەسێك بۆ ﷻ خۆی نزم بکاتەوە ﷻ بەرزی دەکاتەوە} خوای گەورە لەم ئایەتانەی پێشودا چەند جار وشەی تەقوای دوبارە کردەوە تەقوا ئەویە وەك کابرایەك کە بە ناو درِك‌و داڵدا بچێت چۆن دەبێت وریای خۆی بێت‌و بزانێ چۆن قاچ هەڵدەگرێت‌و چۆن دایدەنێت تا درِك‌و داڵ لێی نەدات ئەبێ ئاوەها بێت هەمیشە ئاگای لە خۆی بێت کە دوچاری تاوان نەبێت، جا هەرکەسێ ئاوەها بو پێی دەوترێت (موتەقی).

**اللهم إني أَسْأَلُكَ الْهُدَى وَالتقَى وَالْعَفَافَ وَالْغِنَى**، ئامین.

ئەمە تا ئێرە سێ سیفەتی پەرهیزکاری بۆ باس کردین وا ئێستە سێ سیفەتی ترمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٥) وەپەرهیزکار ئەو کەسانەن کە ئەگەر ئیشێکی خراپەیان کرد، یان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کرد خوایان دەکەوێتە بیرو دەزانن کە خراپەیان کردوە ئەوسا داوای لێخۆشبون دەکەن بۆ گوناهەکانیان‌و دانیان بە هەڵەی خۆیاندا دەنێن، جا کێ هەیە لە گوناح خۆش ببێت بێجگە لە خوا؟ ئەوسا ئەوانەی کە لە سەر

خراپە بەردەوام نەبن‌و دان بەهەڵەی خۆیاندا بنێن‌و لە ترسی سزای خوا لەخراپە‌و تاوان دەست هەڵگرن، ﷲ دەفەرموێ:.

(١٣٦) پاداشتی ئەوانە لێخۆش بوونە لە لایەن خوای خۆیانەوەو چەندین باخچەیە کە لە ژێریاندا چەندین جۆگە دەڕواتو بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، بە راستی چاکترین پاداشتە پاداشتی ئەو کرێکارانە. دەی حەق وایە کە مرۆڤ زەحمەت بۆ ئەوێ بکێشێت‌و هەوڵ بۆ ئەو جێگایە بدات کە ئەو پاداشتە گەورەیەی تێدا یەو بۆی ئامادە کراوە. ئینجا خوای گەورەو دانا دڵخۆشی ئەو موسڵمانانە دەکات کە لە جەنگی ئوحود دا توشی ئەو کارەساتە دڵ تەزێنە بوون‌و دەفەرموێ:

(١٣٧) لە پێش ئێوەدا چەندین ڕەووشت ڕۆیشتووە ئەوەی کە چاك بووە بە گوێی پێغەمبەرانی کردوە سەرکەتوو بوون لە دنیاو لە قیامەتدا هەرچەندە زیانیان پێ گەیشتبێت لە لایەن خوا نەناسانەوە، وەئەوانەی کە خراپ بوون سەرەنجامیان فەوتاندن‌و روخاندن بوە، وە لە ڕۆژی دوایشدا سزایان بۆ ئامادە کراوە، جا پێویستە ئێوەش خۆبگرن،دەی ئێوەش بگەڕێن بە سەر زەویداو جوان ورد ببنەوە لە گەلانی پێشوو ئەوسا تەماشاکەن‌و بزانن دوا رۆژی ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕ بوون چی بوو. کەواتە ئێوەش ئاگاتان لە خۆتان بێت‌و بێ باوەڕی نەکەن بە پیشەی خۆتان، چونکە هەمان رەووشت دووبارە دەبێتەوە. بەداخەوە ئەمڕۆ ئێمە تەماشا دەکەین کاتێ کە ئینسانێکی چاك‌و چاکەکار بانگی خەڵك دەکات و دەیەوێت کە ئەو خەڵکە لە گوناح‌و تاوان بگەڕێنێتەوە لە باتی سوپاس‌و پێ زانین بێ باوەڕو نەزانەکان ئەوەندە بە توندی بەر بەرەکانێ دەکەن کە پیاو چاکەکان ناتوانن ئیسلاحی خەڵك بکەن لە هەمو سەخت تر ئەوەیە کە ئەمانە خۆیان پێ پیاو چاك‌و بەرژەوەندی ویست‌و موسڵمانان بە تۆقێنەرو پیاوکوژو خراپە کار ناودەبەن هەروەك چۆن لە سورەتی بەقەرە /١١_١٢/ دا باسی کردون‌و فەرموی:﴿هەرکاتێك بەوان بوترێت کەخراپە مەکەن لەوڵاتدا دەڵێن: هەرئێمەین چاکە خواز ، خوا دەفەرموێ: ئاگاداربن هەر ئەوانن خراپەکار بەڵام بەخۆیان نازانن﴾ بە راستی بە هۆی ئەو تاوانبارو ستەم کارانەوە کۆمەڵگا هەموی دوچاری خراپە دەبێت‌و هەمو وەزعی لێ تێك دەچێت‌و شیرازەی ژیان دەبچڕێت. بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: دەبڕۆن‌و ئەنجامی ئەوانە تەماشە بکەن‌و بزانن چیان بە سەر هاتوە؟ لەکوێی مێژودا بیستوتانە کەوا کەسانێك کە دژایەتی پیاو چاکانیان کردبێت وژیانێکی چاکیان بردبێتەسەر؟ بەڵکو هەمیشە تێشکاون‌و لە بەین چوون، دەی دەبێ بۆ خەڵکی ستەمکاری ئەم سەردەمە ئەورەفتارە ناپەسندانەی ئەوان دووبارە بکەنەوە؟! ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ:

(١٣٨) ئەم قورئانە ڕێڕونکەرەوەیە بۆ خەڵك بۆ ئەوەی خەڵك رێگای راستەقینە بدۆزێتەوەو بە رێگای بەختەوەری خۆی بزانێت و هیچ بەهانەیەکی نەمێنێتەوە بۆ دوا رۆژو بزانن کە ئەم قورئانە رێ پیشاندەرو ئامۆژگاری کەرە بۆ پەرهیزکاران. لەراستیدا قورئان ئاموژگاری کەرو رێ پیشاندەرە بۆ هەمو کەس، بەڵام چونکە تەنها پەرهیزکاران سودی لێ وەردەگرن بۆیەوای فەرمو. ئینجا خوا دڵخۆشی موسڵمانان دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٩) هەرگیز لاوازو سست نەبن‌و خەم مەخۆن، وەهەر ئێوەن سەرکەوتو ئەگەر باوەڕداربن. پێغەمبەرمان ﷺ وەهنی بۆ مانا کردوین دەفەرموێ:{الْوَهَنُ حُبُّ الدُّنيَا وَكَرَاهِيَةُ الْمَوت/ رواه ابوداود وصححه الالبا /ئەمەیە کە ئینسان دنیای خۆش بوێت‌و بترسێت لە مردن} واتە ئەگەر خۆتان نەدۆڕێنن بە پاشگەزبوونەوەو ترسان لە مردن‌و خۆشەویستی دنیا دڵنیا بن کە ئێوە سەر دەکەون‌و دەیبەنەوە ئەمەش بەو مانا نیە کە موسڵمانان دوچاری هیچ سەختیەك نابن، بەڵکو دەفەرموێ:

(١٤٠) ئەگەر ئێوە دوچاری برین‌و سەختی دەبن خۆئەو گەلە کافرەش هەر وەکو ئێوە دوچاری دەبێت. بۆ ئەوان ناترسن‌و دێنە پێشەوەو بۆ دنیا خۆیان توشی بەڵاو کوشتن دەکەن؟ ئێوە بۆ پارێزگاری کردن لە حەق‌و راستی‌و ئەگەر کوژران دەچن بە بەهەشتێکی هەتا هەتایی بۆ دەبێ لاوازو سست بن؟! وە ئەوە رۆژگارانێکەو ئێمە دەی چەرخێنین لە نێوان خەڵکدا. هەر رۆژێك بە لایەکی دەدەین و هەندێ جار بە کافران، بۆ؟ لە بەر ئەم مەبەستانە:

یەکەم ـ ئەگەر ئەمە نەبێت تاقی ناکرێتەوە، چونکە ئەگەر موسڵمان هەمیشە سەرکەوێت هەمو خەڵك دێتە رێزی موسڵمانانەوە وخۆی بە موسڵمان پێشان دەدات، دەبێ هەندێ جار موسڵمان شکەست بخۆن هەتاکو ئەوانەی گەندەڵ‌و پیس‌و بت پەرەستن دەرکەون‌و لە ریزی موسڵمانان دەرچن‌و موسڵمانان پاك ببنەوە.

دووهەم ـ هەتاکو لە ناو ئێوەدا شایەتی لە راستی‌و دروستی موسڵمانان وەرگرێت‌و ئەو پلە بەرزە بدرێت بە هەندێ لە موسڵمانان ، وە تا بەو جیهادە پیاوانی ئازاو لێهاتوو مشوور خۆری راستەقینەی ئەم دینە دەرخات بۆ خەڵك‌و خەڵك دان بە ئازایی‌و لێهاتویی‌و دڵسۆزی ئەودابنێن ونیشانەی شیاوی بدرێتێ وە هەر بەو جیهادە موناف‌ق‌و ترسنۆك‌و هەلپەرستان دەناسرێن وەکو لە پێشەوە وتمان، ئەمەش یەکێکە لە تاقیکارییەکانی خوای خاوەن

وَلِيُمَحِّصَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَيَمۡحَقَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤١﴾ أَمۡ حَسِبۡتُمۡ أَن تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ﴿١٤٣﴾ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُۚ أَفَإِيْن مَّاتَ أَوۡ قُتِلَ ٱنقَلَبۡتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡۚ وَمَن يَنقَلِبۡ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ وَسَيَجۡزِي ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٥﴾ وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَمَا ضَعُفُواْ وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾ وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٤٨﴾

دەسەڵات بۆ خەڵك تا بزانرێت كێ لەو تاقیكاریە دەردەچێتو كێش دەبەزێت؟ ئەگینا شكست خواردنی موسڵمانان بەڵگەی راستیو دروستی رێبازی بێ باوەڕو ستەمكاران نیە ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ: خۆ خوا ستەمكارانی خۆش ناوێت. جا ئەگەر هەندێ جار سەریان دەخات تەنها بۆ ئەو مەبەستەیەو بۆ ئەوەیە زیاتر ستەمكاران لە خۆبایی بكات تا چاكتر ملیان بشكێنێت وەكو لە هەمان سورەت ئایەتی (١٧٦_١٧٩) دا ئەم مەبەستە بە جوانی روون ئەكاتەوە. بەڵێ خوا ئەو جۆرە شكستانە بە سەر موسڵمانان دا دێنێت تا دەركەون خاوەن باوەڕانی راستو شەهیدان.

﴿١٤١﴾ **سێهەم** - وە دەیەوێت موسڵمانان پاك بكاتەوەو هەرچی گەندەڵیان تێدایە لاچێت تەنها موسڵمانە خاوێنەكان بمێننەوە، بۆ نمونە: كابرای زەڕنگەر رقی لەو زێڕە نیە كاتێ كە دەیخاتە ناو ئاگرو دەیتاوێنێتەوە بەڵكو زۆر دڵخۆشە پێیو دەیەوێت هیچ شتێكی خراپی لە گەڵدا نەمێنێتو زێڕێكی پاڵفتە بێت.

**چوارەم** - وە بەو شێوەیەش ﷻ كافران مەحوو دەكاتەوەولەناویان دەبات، جا ئەگەر ئەو شەڕو بەزمو هەرایە نەبێت ئەوان لە بەین ناچن چونكە لە ناو ئەوانیشدا زۆر كەسی هەڵپەرست هەیەو هاتوەو رێزی ئەوانی زۆر كردووە، بەڵام كە دیتی شەڕ دەكەن و شكەست دەخۆن ئەوانەش لێیان جیا دەبنەوەو كەمێك دەمێننەوە كە دژایەتیو شەڕ لە گەڵ موسڵمانان دا بكەنو لە ئاكامدا بە تەواوی شكست دەخۆنو لە بەین دەچن، بەڵێ ئەم شكستو سەركەوتنە هەردەم بۆ لایەنێكە بۆ ئەم چوار مەبەستەوشتانی تریش كەهەرخواخۆی دەیزانێت واتە موسڵمان هەر هەوڵدانی لە سەرە ئیتر چی روودەدات بە دەست ئەو نیە، ئینجا خوا دەفەرموێ: بە ئیمانداران ئەی ئێوە داوای بهەشت ناكەن؟ دەی چاوەڕێی بهەشت هەر ئاوەها بە خۆڕاییو بێ زەحمەتە؟ وەك دەفەرموێ:

﴿١٤٢﴾ ئایا ئێوە گومان دەكەن كە هەرئاوەهابەبێ زەحمەت بچنە ناو بەهەشتەوە كە هێشتا دەرنەكەوتبێت زانینەكەی خودا بەوانەی كە جیهاد دەكەن لە ئێوە؟ وە هەتا دەركەوێت كە كامانەن خۆگران تا ئەم زانینەی خودا دەرنەكەوێت لە دنیادا نابێ چاوەڕوانی بهەشت بكەن، ﷻ بەر لە دروستبونی مەخلوقات دەزانێت هەر كەس چی دەكاتو چۆن دەبێت جائەگەر دروستی نەكردنایەو بەو زانینەی خۆی لە گەل مەخلوقاتی دا حیسابی بكردایە گلەیی لە خودا دەكرا لە بەر ئەوە دروستی كردینو رێگای پێشان داینو خۆمانی كرد بە سەرپشك بۆ هەڵبژاردنی راستو هەڵەو ئەم تاقیكردنەوانەی دانا تا ئەو زانینە شاراوەی ﷻ دەركەوێت لە دنیاداو ﷻ لە سەر ئەوەی كە لە دنیادا دەیكەن حیسابیان لە گەل دا بكات، مەبەست ئەوەیە نابێ وا بیر بكەیتەوە كە خوا نازانێت بۆیە تاقیمان دەكاتەوە تا بزانێت كێ موجاهیدەو خۆگرەو كێ بێ باوەڕەو ترسنۆك، هەروەكو لەفەرموودەیەك دا كەئیمامی موسلم ریوایەتی كردوە هاتوە كەپێغەمبەرﷺ دەفەرموێ پەنجا هەزار ساڵ پێش لە دروستبونی ئاسمانانو زەوی خودا هەر شتێك كە دەبێت نوسیویەتی وجارێكی تر شتێك زیادو كەم ناكات، ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٤٣﴾بە راستی ئێوە ئاواتی مەرگتان دەخواستو ئەتان وت: ئای كەی جیهاد بێت وبە شەهیدی بمرین زۆر جار داوای شەهادەتتان دەكرد پێش ئەوەی پێی بگەن بە راستی ئەوە گەیشتن بە ئاواتی خۆتان دەی جیهاد بكەنو خۆتان بگرن ئەوەتە خۆتان بە چاوی خۆتان مەرگ دەبینن و هەستی مەرگ دەكەن لەو شەڕە شیرو تیرەدا جاخۆتان بگرن، خۆ نەدەبوو خۆتان كەنار بدایە، دیارە ئەمە سەرزەنشتێكە بۆ ئەو موسڵمانانەی كە لە ئوحودا پاش شكست رایان كردو زۆر پەشۆكان بە تایبەتی دوای ئەوەی كە شەیتان جاڕی دا كە پێغەمبەر ﷺ كوژراوە، جا خوا تەمیەی موسڵمانان دەكاتو تێیان دەگەیەنێت كە دەبێ ئێوە بزانن شەر بۆچی دەكەن، ئێوە شەڕ بۆ دامەزراندنی فەرمانی خوا دەكەنو خودا بەرنامەی ناردوە بۆ ئێوەو پێغەمبەر ﷺ گەیەنەری ئەو بەرنامەیەو نابێ بە نەمانی ئەو واز لەو بەرنامەیە بهێننو دەبێ ئێوە خۆتان بناسنو بزانن خەریكی چین، ئەوەتە دەفەرموێ:

(١٤٤) خۆ محمدیش جگە لەوەی کە پێغەمبەرێکە ﷺ وەکو پێغەمبەرانی پێش خۆی شتێکی تر نیەو نابێ گومانی خراپ ببەن جائایا ئەگەر ئەو بمرێت یان بکوژرێت ئێوە پاشگەز دەبنەوە؟ وە ئەو کەسەی کە پاشگەز ببێتەوەو کافر ببێت با بزانێت کە هیچ زیانێك لە خوا نادات بەڵکو خۆی زیان دەکات، وە بەم زوانە خوا پاداشتی ئەو کەسانە دەداتەوە کە شوکری خوا دەکەن‌و پەیڕەوی لەپێغەمبەر ﷺ دەکەن چ زیندو بێت چ مردو.

(١٤٥) هیچ نەفسێك نامرێت مەگەر خودا ماوەی پێ بدات کەئەوە نوسراوێکی دواخراوە تا کاتی خۆی نەیەت نایەتە پێشەوەو ئەنجام نادرێت کەواتە بۆ رادەکەن‌و بۆچی دەترسن؟ ئەوسا هەر کەسێك پاداشتی دنیای دەوێت پێی دەدەین‌و هەر کەسێکیش پاداشتی قیامەتی دەوێت پێی دەدەین‌و ئێمە ستەم لە هیچ کەسێك ناکەین‌و بەم زوانە پاداشتی سوپاسگوزاران بە گوێرەی سوپاس‌و کردارەکانی دەدەینەوە. پێویستە ئەوەش بزانن مەرج نیە هەرکەسێك بۆ دنیا هەوڵ بدات دنیای دەست کەوێت، چونکە ئەگەر لێرەدا بە گشتی وای فەرموە بەڵام ئەوەتە لە سورەتی الاسرا ئایەتی /١٨ ئەم حوکمە تایبەت دەکات‌و دەفەرموێ:﴿هەرکەسێك کە ئەم ژیانەی دەوێت ئێمەبەوکەسەی کەدەمانەوێت دەیبەخشین بەپێی ئەوەی کە ئارەزۆمان لێ بێت﴾ ئینجا بۆمان باس دەکات کە تەنها ئێوە نەبون کەدوچاری تاقیکاریو شەڕی دوژمنان هاتبن.

(١٤٦) وە زۆر لە پێغەمبەران بون کە خوا پەرستانێکی زۆر لە گەڵیاندا بوون و شەڕیان کردوە لە دژی کافران‌و بێ باوەڕان‌و شەهید کراون‌و بریندار بوون کەچی ئەوان هەرگیز چۆکیان دانەداوەو لاوازی روی تێ نەکردون کە واز لە ئایین بهێنن‌و خەریکی دنیا پەرەستی ببن‌و حەز بە مردن نەکەن لە رێگای خواداو هەرگیز لاواز نەبوون کەواز لە جیهاد بهێنن ئەگەر چەند کەسێکیان لێ شەهید دەبو هەوڵیان داوە کە جێگەیان پڕ بکەنەوەو هەرگیز گەردن کەچ نەبوون بۆ دوژمن و خۆیان نەداوە بە دەستی دوژمنەوە تەنانەت زۆر جاریش بووە کە پێغەمبەران کوژراون، بەڵام پەیڕەوانیان وازیان لە رێبازەکانیان نەهێناوەو تەسلیمی دوژمن نەبوون دەی ئەی ئۆممەتی محمد ﷺ وە ئەی پەیڕەوانی پێغەمبەری خوا بۆ دەبێ ئێوە بە بێ هێزو لاواز خۆتان پیشان بدەن‌و خۆتان تەسلیمی دژمنانی ئاینەکەتان بکەن پێتان وایە کە ئەوان دۆستن بۆ ئێوە بە راستی ئەوان هەرگیز دۆستی ئێوە نین‌و راستتان لە گەڵدا ناکەن، بەڵکو پێویستە خۆ بگرن وەکو ئەو خوا ناسانە تا خوا یارمەتی ئێوەش بدات‌و ئێوەشی خۆش بوێت وەك دەفەرموێ: وە خوای گەورە مرۆڤی

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَرُدُّوكُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ (١٤٩) بَلِ ٱللَّهُ مَوْلَىٰكُمْۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلنَّٰصِرِينَ (١٥٠) سَنُلْقِى فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلرُّعْبَ بِمَآ أَشْرَكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًاۖ وَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُۚ وَبِئْسَ مَثْوَى ٱلظَّٰلِمِينَ (١٥١) وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلْتُمْ وَتَنَٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَعَصَيْتُم مِّنۢ بَعْدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنْيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلْءَاخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمْ عَنْهُمْ لِيَبْتَلِيَكُمْۖ وَلَقَدْ عَفَا عَنكُمْۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضْلٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ (١٥٢) ۞ إِذْ تُصْعِدُونَ وَلَا تَلْوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٍ وَٱلرَّسُولُ يَدْعُوكُمْ فِىٓ أُخْرَىٰكُمْ فَأَثَٰبَكُمْ غَمًّۢا بِغَمٍّ لِّكَيْلَا تَحْزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمْ وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمْۗ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ (١٥٣)

خۆگری خۆش دەوێت ئەو کەسەی کەوا شەڕ دەکات لە بەر خاتری خواو وەهن روی تێ ناکات‌و خۆی نادات بە دەست دوژمنەوەو خۆی لە جیهاد ناشارێتەوە ئەوە خۆگرەو خوداش ئەوی خۆش دەوێت.

﴿ رِبِّيُّونَ ﴾ بە مانای خوا پەرستان لێکماندایەوە هەندێ دەڵێن: واتە پەیڕەوان‌و ژێر دەستە کەهەردوو مانا یەك دەگرێتەوە، چونکە بێگومان پەیڕەوانی ئەو پێغەمبەرانە خوا پەرست بوون. جا پاش ئەوەی کرداری ئەوانی بۆ باس کردین، ئینجا هەندێ لە وتەکانی ئەوانیشمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٤٧) قسەی ئەوان بێجگە لەوەی کە دەیان وت: ئەی پەروەردگارمان سەرمان بخە بە سەر دوژمنانی دەرونی خۆمانداو لەگوناهو وزیادە رەوییەکانمان خۆش ببە، وە خوایە پێمان بە هێزکەو توانای وامان پێ ببەخشە کەخۆگربین لە سەر ئاینەکەت‌و یارمەتیمان بدەیت‌و سەرمان بخەیت بە سەر گەلی کافراندا. هەر یەکێك بۆ خۆی داوای ئەکرد، چونکە ئەیزانی کە بە باوەڕو راستی نەبێت خوا یارمەتی نادات ئەگەر چی رێگای خۆیان بە رێگایەکی چاك دەزانن، بەڵام دەترسن کە بەو شێوەیە نەبێت کە خوا داوای دەکات بۆیە زۆر دەترسن وئا بەو شێوەیە دەپارێنەوەلە خوا. جێگای داخە ئەمرۆ هەر کەسێك لە ئێمە نەختێك کە لە دین شارەزابو ئەگەر پێی بڵێیت گوناهباری

ئەوەندە خۆی پێ گەورەیە زۆر زو نارەحەتو تورە دەبێت دەڵێت: چۆن بە من دەڵێیت گوناهباریت؟

(١٤٨) جائەو کۆمەڵەی کە ئاوەها کرداریان دەکردو ئاوایان دەوت بە زار خوای گەورە پاداشتی چاکی پێ دانەوە، بە چی؟ بە پاداشتی دنیا، کە سەرکەوتن بە سەر دوژمنەکانیانداو بە پاداشتێکی جوانی قیامەتیش چونکە ئەمانە چاکەکارنو خوای گەورەش مرۆڤی چاکەکاری خۆش دەوێت. بەم شێوەیە خوا موسڵمانان تەمێ دەکاتو رایان دەهێنێت لە سەر پەرهیزکاریو خۆگرتنو لۆمەیان دەکات کە بۆچی پێغەمبەرتان بە جێ هێشت، جا تا جارێکی تر شتی وانەکەن دەفەرموێ:

(١٤٩) ئەی خاوەن باوەڕان ئەگەر ئێوە بە گوێی مونافق وکافرانو بێ باوەڕان بکەن ئەوان کافرتان دەکەنەوە ئیتر ئەو کاتە ئێوە دەبن بە مرۆڤێکی زیان لێکەوتو ڕەنجەڕۆ، واتە دەبێئاگاتان لە خۆتان بێت کە نزیکی شتێ مەکەونەوە کەبۆنی خوانەناسی لێبێت چونکەکافرو بێ باوەڕان هەمیشە خەریکی ئەوەن کە ئێوەش کافر بکەن وەکو خۆیانو دوچاری سزای قیامەتو سەرشۆڕی دنیاتان بکەن، ئینجا دەفەرموێ:

(١٥٠) واز لەوتاوانانە بهێنن چونکە خوا سەرپەرەستو یارمەتی دەری ئێوەیە، وە هەر ئەو چاکترین یارمەتی دەرە بۆ دۆستانی خۆی، دەی ئێوەیش تەنها بەو پشت ببەستنو چاوەڕێی سەرکەوتنو یارمەتی هەر لە خۆی بکەن. پاشان مژدە بە خاوەن باوەڕان دەدات کە لە کافران نەترسن، چونکە:

(١٥١) بەم زوانە ئێمە ترس دەخەینە ناو دڵی بێ باوەڕانو کافرانەوە، بۆچی ترس دەخەینە ناو دڵیانەوە؟ بە هۆی ئەوەی کە شەریکیان بۆ خوا قەرار داوە، شەریك واتە هاوەڵ بۆ خوا دانان جا ئیتر ئەو هاوەڵە خۆشەویستی ماڵ بێت، خۆشەویستی ناوو شورەتو کورسیو شەخسو حیزب بێت، ئەو موشریكو بێ باوەڕانە هەر کاتێك کەموسڵمانان هەڕەشەیان لێ کردن زۆر ئەترسن، چونکە خوا خۆی لەو کاتانەدا ترس دەخاتە ناو دڵیانەوەو لە بەرامبەر گیان فیداییو ئامادەیی موسڵماناندا هیچیان لە دەست نایەتو کورد واتەنی "کونی مشکیان لێ دەبێت بە قەیسەری" و" لە سێبەری خۆیشیان سڵ دەکەن" بەڵێ خوای گەورە ئاوەها دەیانترسێنێت، چونکە ئەوانە شتانێك دەپەرەستن کە هەرگیز بۆ ئەوە خوای گەورە دەلیلێکی بۆ نەناردونو هیچیان بە دەستەوە نیەوەو جێگەی ئەوان ئاگری جەهەننەمە، وە پیسترین جێگایە ئاگری جەهەننەم بۆ ستەم کاران ،

جا با موسڵمانان پیاوانە بەرامبەر دوژمنانی خۆیان بوەستن وە دوژمنانی خۆیان بناسنو دڵنیا بن کە ئەگەر ئەوان راست بکەن خوا ترس دەخاتە ناو دڵی دوژمنانەوە وەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُن أَحَدٌ قَبْلِي نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيمَا رَجُلٍ مِنْ أُمتِي أَدْرَكَتْهُ الصلاةُ فَلْيُصَلِّ وَأُحِلتْ لِي الْمَغَانِمُ وَلَمْ تَحِل لِأَحَدٍ قَبْلِي وَأُعْطِيتُ الشفَاعَةَ وَكَانَ النبِي يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصةً وَبُعِثْتُ إِلَى الناس عَامةً / متفق عليه/ من پێنج شتم پێ دراوە کە نەدراوە بە هیچ پێغەمبەرێکی تر پێش من. یەکەم ـ یارمەتی درام بە ترس بەئەندازەی رۆیشتنی یەك مانگ رێگا. دووهەم ـ زەویم بۆ کرا بە مزگەوتو پاکۆکەر جاهەرکەسێك لە ئومەتی من لەهەرکوێدا کاتی نوێژی هات با لەو جێگایەدا نوێژ بکات. سێهەم ـ دەسکەوتەکانی غەزام(الغنیمە) بۆ حەڵاڵ کرا کە بۆهیچ کەسێك لەپێش مندا حەلاڵ نەبووە. چوارەم ـ شەفاعەتی گەورەم پێ درا. پێنجەم ـ هەرپێغەمبەرێك رەوانە دەکرا بۆ گەلوتیرەکەی خۆی من رەوانە کرام بۆ هەمو خەڵك بە گشتی} ئەوەبو خوای گەورە یارمەتی پێغەمبەرو یارەکانی داو زاڵی کردن لەو شەڕانەدا بەلاَم لەم غەزایەدا لە خۆیانیان تێك دا ئەوەیش بەم شێوەیە بو کەپێغەمبەری خوا ﷺ کۆمەڵێکی پەنجا کەسی لە سەر بەرزاییەك داناو فەرموی: لێرە دەرنەچن ئەگەر دیتان ئەوان بە سەر ئێمەدا سەرکەوتوون ئێوە دانەبەزنو جێگاکە چۆڵ نەکەن، وە ئەگەر دیتان سەریش کەوتین ئێوە هەر لەوێدا ببن، وە فەرمویشی کەس شەڕ نەکات هەتا خۆم نەڵێم، ئینجا لە کاتێکدا کە دوو زرێیەی پۆشی بو هاتە ناو یارەکانیو هەڵی نان لە سەر شەڕو شمشێرەکەی خۆی رووت کردو فەرموی:{کێ ئەم شمشێرەم لێ وەرئەگرێتو مافی خوای پێ دەدات؟ چەند کەسێك هەڵسان وەری بگرن لەوانە عەلیو زوبەیرو عومەر بوون تا ئەبو دوجانە سەماکی کوڕی خەرەشە هەستاو وتی: مافی چیە ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرموی: ئەوەندە شەڕی پێ بکرێت لار ببێت. وتی: من وەری دەگرم. پێغەمبەریش ﷺ پێی دا} ئەو ئەبو دوجانەیە پیاوێکی زۆر زرنگ بو لە کاتی شەڕدا خۆی هەڵدەکێشاو پارچە پەڕۆیەکی سوری هەبو کە دەیبەست لە سەر ئیتر دەیانزانی تا مەرگ شەڕ دەکات، کاتێ کە شمشێرەکەی وەرگرت پەرۆکەی بەستو دەستی کرد بە خۆپێشاندان لە نێوان ریزی موسڵمانانو کافران داو پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {ئەم جۆرە رۆیشتنە خوا رقیەتی لێی مەگەر لەم شوێنانەدا} ئەبوسوفیانیش لەو لاوە کافرەکانی هەڵدەناو بە هەلگری ئالاکەیانی وت: کاتی خۆشی لە بەدرا ئالاَ بە دەستی ئێوەوە بو ئێمە شکاین ئێستا ئەگەر دوژمنمان بۆ بێت لە لای ئالاکەوە بۆمان دێت یان پیاوانە هەڵیگرن یان بیدەن

بەخۆمان با خۆمان هەڵیگرین بەمە خوێنی جوڵاندنو هەڵگری ئاڵا (تەلحەی کوڕی ئەبو تەلحە) هاتە مەیدانەوەو داوای هاوسەری کردو زرنگترین سواری قورەیش بو عەلی یان زوبیر بۆی چوو وەکو هەڵۆ دابەزیە سەریو سەری لە لەشی کردەوە پێغەمبەر ﷺ زۆری پێ خۆش بوو فەرموی: (الله اكبر) موسڵمانانیش هەموویان وتیان: (الله اكبر) جا شەڕ دەستی پێ کردو موسڵمانان کافرەکانیان تارو مار کردنو کەوتنە سەریان لەم کاتەدا ئەوانەی سەر بەرزاییەکە کەوتنەچی بکەین چی بکەینو فەرماندەکەیان (عبدالله ی کوری جوبەیر) وتارێکی بۆ دانو داوای لێ کردن کە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ نەشکێننو بمێننەوە، بەڵام هەندێکیان وتیان: مەبەستی پێغەمبەر ئەوە نەبوە ئەگەر سەریش بکەوین ئێمە هەر لە سەر ئەم چیایە بین جادابەزینو دوژمن بەمەی زانیو هێرشی هێنایە سەر ئەو چیایەو ئەوانەی لەوێ بوون تا شەهید کران شەڕیان کرد بەڵام دوژمن سەرکەوتو لە پشتەوە موسڵمانانیان دایە بەر تیرو هاواری سەرکەوتنیان کردو دوژمن هەموی گەڕانەوە سەر موسڵمانان هەرکەس لە بیری خۆ رزگار کردنا بو هەرچەند هەندێکیان پەلاماری سەر چیاکەین دا، بەڵام تازە بێ کەڵك بو لە پێشەوە شەڕیان دەکرد بۆ لە ناوبردنی کوفر ئێستە ئەبێ شەڕ بکەن تا خۆیان لە مردن رزگار بکەن، پێشەکی بە رێكو پێکی دەجەنگان وا ئێستا پەرتەوازە بوونو فەرماندەکەشیان دیارنیەو موسڵمانان تێکەڵو پێکەڵ بوونو موسڵمان لە موسڵمانی دەداو نەی دەزانی موسڵمانەو لەو کاتەشدا جاڕ درا کە پێغەمبەر کوژراوەو هەموویان باوەڕیان کردو هەندێکیان وتیان: ئێمە لە سەر پێغەمبەر شەڕمان دەکرد مادام پێغەمبەر نەمابێ ئیتر با بچینەوە ناو تیرەو ماڵی خۆمان ئەوان دەمانپارێزنو گەڕانەوە بۆ ناو شاری مەدینە تەنانەت ئەبوبەکرو عومەرو تەلحە لە کوشتنی پێغەمبەر دڵنیا ببونو لە داخدا خۆیان دابو بە زەویدا، ئەنەسی کوڕی نەزر دای بە لایانداو وتی: ئەوە بۆچی دانیشتون وتیان: پێغەمبەری خوا ﷺکوژراوە وتی: جا ئێوە دوای ئەو ژیانتان بۆچیە؟ هەڵسن با بمرین لە سەر ئەوەی کە ئەوی لە سەر مردوە، ئینجا خۆی روی کردە دوژمنو جەنگێکی فیداکارانەی کردو نەکوژرا هەتا حەفتا برینی لێ کرا بە رمو شمشێرو تیر وای لێهات کە کەس نەیدەناسیەوە تەنها خوشکێکی خۆی نەبێت کە بە پەنجەی دا ناسیەوە. خوا لێخۆشبو پارێزانی دەڵێت: قورەیشیەکان کە ئەم هاوارەیان بیست بە جارێ هێرشیان بردە سەر ئەو ناوچەیە کە پێغەمبەری خوای ﷺلێ بو دیارە دەیان ویست لە درۆو راستی هەواڵەکە تێ بگەن، یاخود هەمو بەشدار بن لە کوشتنو برینیاو ئەم بەشدار بونەشیان ببێتە جێگەی شانازیو پشتاوپشت بگەڕێتەوە ئەمەیە راو تێگەیشتنی کوفرو نەفامیەتی لە هەمو چەرخو دەورێکاو هەوڵ دەدا بۆ بەشدار بون لە کوژاندنەوەی بانگی ئاشتی خوازیو رزگاری داو خۆی بە بەختەوەر دەزانێت ئەگەر بەشی ببێت لە لەناوبردنی بانگ کەراندا !! ئالەم کاتی تەنگانەو تەنگو چەڵەمەدا پێغەمبەری خوا ﷺ وەکو کەژی دامەزراو لە جێگای خۆیدا مایەوەو لەرەو جوڵەی لێوە نەهاتو کەوتە تیر باران کردنی کافرەکان هەتا خەریك بو تیرو کەوانەکەی بشکێ، وە کۆمەڵێ لە یارەکانی لە دەوری مابونەوە لەوانە (ئەبو تەلحە) ی یاریدەدەر کە پارێزگاری پێغەمبەری دەکردو تیر ئەندازێکی بلیمەتو دلێر بو تیرەکانی هەڵ رشتە بەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی وت: روی من فیدای روی تۆ بێت، هەر موسڵمانێ لەوێوە بهاتایە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرمو: تیرو کەوانەکەت بێنە بۆ (ئەبو تەلحە) جا کە تیری دەهاوێشت پێغەمبەر ﷺ خۆی هەڵدەبڕی تا بزانێ کافرەکان چی دەکەن ئەبو تەلحەیش دەیوت: ئەی پێغەمبەری خوا دایکو باوکم فیدات بێ مەڕوانە نەوەك تیرێکی دوژمنت بەر بکەوێت، لاشەم لە پێش لاشەتەوەیە. قورەیشیەکان کەوتنە بەرد بارانکردنی پێغەمبەر ﷺ و (عوتبەی) کوڕی ئەبی وەقاس بەردێکی گرتە پێغەمبەرو دانی پیرۆزی شکاند حاتەبی کوڕی ئەبو بەلتەعە کەوتە سەریو کوشتی (عبدالله)ی کوری شەهابی زەهری رووی شیرینی بریندار کرد وە (ابن محيئە) ی چەپەڵ بەردێکی پیا ماڵیو ئەڵقەی زرێکەی چوو بە روویداو هەردوو کوڵمی پیرۆزی بریندار بوو (ابو عامر) ی فاسق چەند چاڵێکی هەڵکەندبوو سەریانی داپۆشیبوو بۆ ئەوەی موسڵمانەکان تێی بکەونو پێغەمبەری خوا ﷺ کەوتە یەکێ لەوچاڵانەو زۆر ئازاری پێ گەیشت هەردوو ئەژنۆی بریندار بوونو لە خۆ چوو (عەلیو تەلحەی) کوڕی عوبەیدوڵا بە پەلە رایان کردو دەریان هێنایەوەو بەم کۆمەڵەوە دەیان ویست وردە وردە سەرکەون بۆ سەر چیاکە تا خۆیان رزگار بکەنو نەیەڵن دووبارە پشتیان لێ بگرنەوەجا بە هێزی بازوی تیر ئەندازەکان توانیان ئەو کافرانە بگێڕنەوە کە دەیان ویست بچنە سەر چیاکەو موسڵمانە پەرتەوازەکان گەڕانەوەو ئەت وت لە خەو راپەڕیوون. قورەیش بەم هەواڵە زۆر دڵخۆش بوونو ئەبو سوفیان لە ناو کوژراوەکاندا دەگەڕا تا بیدۆزێتەوە، وە لە سەربڕیاری پێغەمبەر ﷺ موسڵمانان ئەو قسەیەیان بە درۆ نەخستەوە نەوەك بەجارێك هێرش ببەنە سەریانو لە ناویان ببەن تا(کەعبی) کوڕی مالیك روو بە ئەبو دوجانەو هاوڕێکانی هاتو چاوی بە پێغەمبەر کەوتو بە دەنگی بەرز بانگی کردە موسڵمانەکان، مژدە بێت ئەمە پێغەمبەرە ﷺ پێغەمبەریش دەستی لێ هەڵوەشاند کە بێ دەنگ بەو لە کاتی رۆیشتندا پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەدا بەسەر شانی (سەعدی) کوڕی

ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ مِّنكُمۡۖ وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ يَقُولُونَ لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ قُل لَّوۡ كُنتُمۡ فِي بُيُوتِكُمۡ لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ وَلِيَبۡتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمۡ وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمۡۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١٥٤ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ مِنكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ إِنَّمَا ٱسۡتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِبَعۡضِ مَا كَسَبُواْۖ وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٥٥ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَوۡ كَانُواْ غُزّٗى لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١٥٦ وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوۡ مُتُّمۡ لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ١٥٧

ئەبی وەقاسو سەعدی کوڕی عوبادە دا ئەبوبەکرو عومەرو عەلیو زوبەیرو حاریسی کوڕی حەسمەو چەند کەسێکی تری لە گەڵا بوو. خوا لێخۆشبوو پارەزانی دەڵێت: بانگەکەی کەعب دیارە تینی زۆری کردە سەر قورەیشیەکان بەڵێ هەندێکیان باوەڕیان نەکردو وایان زانی بۆ زات نانە بەری موسڵمانەکانە بەڵام زۆریان بە راستیان دانا بۆیە دەیان ویست بڕۆن بە شوێنیاندا، وە لەو کاتەدا عوسمانی کوڕی عبداللە ی کوڕی مغیرە روی تێ کردنو پێغەمبەری بەر چاو کەوت وتی: ئەوە (محمد)ە دەرنەچم ئەگەر دەرچێت ئەوەی وتو وڵاخەکەی ختیە خوارەوە کەوتە ناو چاڵێك حارس ی کوڕی حسمە چو بۆیو کوشتی، وە ئوبە ی کوڕی خەلەفیان پێ گەییو ئەی وت: کوا (محمد)؟ دەرنەچم ئەگەر دەرچێت ئوبەیە بە سەر وڵاخێکی چاکەوە بو کە لە مەکەدا دای بەستبو ئەی وت: (محمد) ی لە سەر دەکوژم کە پێغەمبەری خوا ئەوەی بیست فەرموی: ئەگەر خوا حەز کا من ئەو دەکوژم کە نزیك بووەوە پێغەمبەر ﷺ رمەکەی حارسی گرت بە دەستەوەو رمێکی لێداو برینداری کرد دیار بو جێگای کوشندەی گرت بو بۆیە گورج گەڕایەوەو وەك گا دەی بۆڕاندو لە رێگادا کوشتیو ئاواتەکەی پێغەمبەر ﷺ هاتەدی. جا پێغەمبەر ﷺ بێجگە لە ئوبەی کەسی تری نەکوشتوە. کاتێ چونە سەر تەوقە سەری کەژەکە بەردێك هەبوو پێغەمبەر ویستی بچێتە سەری بەڵام نەیتوانیو بە کۆمەڵ سەریان خست ئا بەم شێوەیە دەرکەوت کە خوا پێشەکی موسڵمانانی سەرخست، بەڵام خۆیان بوون بە هۆی ئەوشکستەی خۆیان. جا ئێستا فەرمون بۆماناى ئەم ئایەتانەی تر کە دێن، خوا دەفەرموێ:

(١٥٢) بە راستی اللَّهُ راستی کرد لە گەڵ ئێوەداو بەڵێنەکەی خۆی هێنایەدی کاتێ کەئێوە بەفەرمانی خوا ﷺ ئەوانتان دەکوشتو لاشەیان لێ دەکەوت لە مەیداندا تا ئەو کاتەی کەترسانو ئێوەی تیرەنداز لە بارەی دابەزینەوە لەسەر چیاکە ناکۆکیتان لێ پەیدا بو، وە سەرپێچیتان کردو فەرمانی پێغەمبەری خواتانﷺ شکاند لە پاش ئەوەی کە من پێشانم دان ئەوەی کە ئێوە پێتان خۆشبوو کە سەر کەوتنو دەستکەوتێکی چاك کەلەگۆڕەپانی جەنگدا کەوتبو جا هەندێکتان دنیاتان دەویست و هەندێکی ترتان دوا رۆژ، پاشان لەبەر ئەوەخوا ئێوەی لادا لەو سەرکەوتنە بە سودی کافران تاکو تاقیتان بکاتەوە، بەراستی خوا لەو تاوانەش عەفوی کردن ،وە خوا خاوەنی فەرو خەیری زۆرە بۆ خاوەن باوەڕان. تەماشا بکەنو سوپاسی ئەو خوا میهرەبانو بەخشندەیە بکەن ئەوەتە پێش ئەوەی کە باسی بەزینو راکردنەکەیان بکات دەفەرموێ: وە بەراستی خوا لەو تاوانەی بەخشین. ئینجا باسەکەیان بۆدەگێڕێتەوە کەچییان کردوەو دەفەرموێ:

(١٥٣) وەبیریان بهێنەرەوەئەو کاتەی کە بە پەلە سەردەکەوتن بۆ چیاکە، چونکە هەر زانیان وەزعیان باش نیەو شکاون بە پەلە بەرەو چیاکان رۆیشتن وئاوڕتان نەدەدایەوە بۆ لای هیچ کەسێكو راتان دەکردو دەرۆیشتن، وەپێغەمبەریش بانگی دەکردن کە لە دواتانەوە بو : ئەی بەندەکانی خوا بۆ لای من وەرن من وام لێرە، جا چونکە گوێتان بە بانگەکانی پێغەمبەر نەداو فەرمانتان شکاند ئا بەم شێوەیە اللَّهُ پاداشتی ئێوەی داوە بە پەژارە لە سەر پەژارە جا ئەمە دەگونجێت بۆ هاوشکڵی بێت واتە دوای ئەوەی کە ئەو هەواڵەیان پێ درا کە پێغەمبەر کوژراوە خۆئەوە پێغەمبەرە ﷺ بانگتان دەکاتو دەفەرموێ: وەرن بۆ لای من ئەی بەندەکانی خوا من لێرەم کەوابو پاداشتی دانەوەو ئەو غەمەی بۆکردن بە فەرەحیوخۆشی. یان دەگونجێت هەر بە مانای خۆی بێت واتە ئێوە لەوێ دا شکستان خواردو لە پاشان پەژارەیەکی گەورەتری خستە بەرتانو بەمە پاداشتی دانەوە کەئەمەیان شێوەیەکی لۆمە کردنی تێدایە، لەراستیدا پاداش نەبو سزا بو، چونکە شکەستیان خواردو چەند نەفەریان شەهید بوونو ئەوسەرکەوتن وغەنیمەتەیان هەمو لە دەست دا، لە دوای ئەمەش بیستیان کە پێغەمبەر شەهید بووە ﷺ کە ئەمە لە هەمویان گەورەتر بو لە لایان کە لە دوایی دا بۆیان دەرکەوت کە ئەمەراست نەبوە ئیتر ئەوانی تریان هەمو لە بیر چونەوەو بە لابردنی ئەو پەژارە گەورەیە پاداشتی دانەوە وشاد بوونەوە بە پێغەمبەرﷺو هەموو

ئێش‌و ئازارەکانی تریان لە بیر نەما وەك دەفەرموێ: تا خەفەت نەخۆن لە سەر ئەوەی کە فەوتاوە لە سەرکەوتن‌و لە غەنیمەت‌و لە سەر ئەوەی کە توشتان هاتوە لە شەهید بوون‌و بریندار بونتان، وە خوای گەورە ئاگادارە بەوەی کە ئێوە دەیکەن‌و لە خراپەکانتان خۆشبوو پاداشتی چاکەکانیشتان دەداتەوە، جاکە پێغەمبەرﷺ گەیشتەوە بەوان هەمویان لە دەوری کۆبونەوەو داخ‌و خەفەتیان سوك بوو خەو گرتنی وەك دەفەرموێ:

(١٥٤) لە پاشان اللّٰه لە دوای ئەم پەژارەو ناڕەحەتیە ئاسایشێکی پێ دان کە ئەو ئاسایشەش وەنەوزەیەك بو کە کۆمەڵێ موسڵمانانی ڕاستی گرتەوەو لەو کاتە ناسکەداو لە ناو ئەو دوژمنانەدا خەو گرتنی، وە کۆمەڵێکی تر کە تەنها مەبەستیان خۆیان بو کە گومانی ناڕەوایان دەبرد بە خوا بە گومانێکی نەزانانەو دەیان وت: ئەگەر ئەم ئیشە بۆ خوایە بۆچی دەبێ بشکێین؟ بەڵام خاوەن باوەڕان هەر بەم وەنەوزەی خۆیان بۆیان دەرکەوت کە خوا یارمەتی دەرو سەرپەرشتیانە، چونکە لەم حاڵەتەدا کابرا ڕا دەکات‌و خوا خوایەتی نەکوژرێت. کەچی خەو بیگرێت؟! هەتا دەڵێن زۆر جار شمشێرەکانمان لە دەستمان دەکەوت وهەڵمان دەگرتەوە ئا بەم خەوە دەردەکەوێت کە سودێك هەیە لە ئاراداو هەر ئاوەها بەرەڵا نەکراون‌و کەس ئاگای لێ نەبێت، بەڵام مونافقان ونەفامان لەو ڕاستیانە تێ ناگەن‌و گومانی خراپ دەبەن‌و دەڵێن: ئایا لەم ئیشەدا هیچ سوودێك هەیە؟ ئایا ئێمە ئیشمان تەواوە یان هێشتا ماومانە؟ ئایا ئەگەر خوا خۆی چی ویست ئەوە دەبێت ئیتر بونی ئێمە چ سودێکی هەیە؟ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ:، بەڵێ بە ڕاستی ئەم ئیشە هەموی بەدەست خوایەو فەرمانی ئەوەو دەبێ جێ بە جێ بکرێت‌و بێ سوود نیە ئیتر ئەو سودانە بزانین یان نەزانین، بەر استی قسەی ئەو مونافقانە ڕاستە، بەڵام مەبەستیان پیسە ئەگینا هەمو شت بە دەست خوایەو هیچ شتێك بە بێ بڕیاری ئەو ناکرێت‌و نابێ‌و کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە، ئینجا خوا ناو دەرونیان باس دەکات‌و دەفەرموێ: ئەوانە دەیشارنەوە لە نەفسی خۆیاندا شتێك کە دەری ناخەن بۆ تۆ ئەی محمد ﷺ واتە لە لای خۆیان گومانیان هەیە کە ئەمە ڕاست بێت‌و پێیان وانیە کە لە سەر ڕێبازێکی ڕاستن‌و دەڵێن: ئەگەر لەم ئیشەدا شتێك بۆ ئێمە بوایە ئێمە لێرەدا نەدەکوژراین ئینجا اللّٰه دەمکوتی ئەو مونافقانە دەکات‌و دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر ئێوە لە ماڵی خۆتاندا بوونایە ئەوانەی کەوا کوشتن لە سەریان فەرز بوە دەبوایە بهاتنایە ئەو جێگایەی کە تێیدا کوژراون‌و بکوژرێن‌و پاش‌و پێشی نەدەبوو اللّٰه ئەمەی کردوە تا تاقیتان بکاتەوەو ناو دڵتان ئاشکرا بکات، تا پاك‌و خاوێن بکاتەوە ئەوەی کە لە ناو دڵتاندایە، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە لە ناو دڵەکاندایەو کام دڵ لەگەل خوای خۆی ڕاست دەکات‌و کامیان درۆ دەکات جا بەو تاقیکردنەوانە زۆریان ئاشکرا دەبن‌و دەبینی ڕاستگۆیان تا مەرگ بە بەردەوامی لە سەر ئایین‌و بەرنامەی خوا دەجەنگن‌و درۆزنان لە نیوەی ڕێگاداو لە ناو ئیشەکەیاندا بە شێوەیەك ڕەفتار دەکەن لە گەڵ ئایندا کەبەچاکی ناپاکیان دەردەکەوێت.

(١٥٥) بەبێگومان ئەو کەسانەی ئێوە کەلەو ڕۆژەدا ڕایان کردو پشتیان کردە جەنگەکە هەر شەیتان بو هەڵیدێران بە هۆی تاوانانێکەوە کە لە پێشەوە کردبویان، وتراوە "گوناح گوناح ڕادەکێشێت" ئەگینا شەیتان نەیدەتوانی هەڵتاندێرێت‌و لەناو دڵتاندا لانە بکات شەیتان لە بەرامبەری قورئان‌و یادی خواوە ئەوەندە لاوازە کە هەر وترا پەنا دەگرم بە خوا لە شەیتانی دەرکراو ﴿أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ﴾ ئیتر بەسەو توانای نامێنێت. جا خوای گەورە لە تاوانی ئەو ڕاکردنە چاوپۆشی کرد، بە ڕاستی خوا زۆر لێبوردەو بە حەوسەڵەیە. تەماشا کەن ﴿غَفُورٌ حَلِيمٌ﴾ / لێبوردەو بە حەوسەڵە﴾ی بەکار هێناوە واتە ئێوەش ئەگەر کەمێك سەبرتان بگرتایە لەو چیایەو نەهاتنایە خوارەوە ئیشەکەی ئێوەش ئەو کاتە سەرکەوتودەبو. ئەمەش هەڕەشەیەکی توندە لە موسڵمانان کە نابێ وەك کافران بیر بکەنەوە کە هەمو ئارەزۆیان تەنها دنیایەو باوەڕیان بە زیندوو بونەوەو حیساب نیە، ئێمە باوەڕمان بە قیامەت هەیەو چاوەڕوانی پاداشتی گەورەی ئەو ڕۆژەین،جا دەفەرموێ:

(١٥٦) ئەی خاوەن باوەڕان ئێوە وەك ئەو کافرانە نەبن، کە بە براکانیان دەوت کاتێك کە دەچون بۆ سەفەرێك یان بۆ جیهاد: ئەگەر ئەوانە لەلای ئێمە بونایە نەدەمردن‌و نەدەکوژران. ئێوە وەکو ئەوان نەکەن تا خوای گەورە بەم شێوەیە داخ‌و خەفەتیان بۆ زیاد بکات و بە هۆی ئەم بیرو باوەڕە هەڵەوە زیاتر داخداریان بکات بۆ ئەو کەسانەیان کە کوژراون، یان مونافقان‌و کافران ئاوایان دەوت تا موسڵمانان زیاتر خەفەت بخۆن جا دەفەرموێ: هەر خوایە کەزیندو دەکاتەوەو دەمرێنێت، هەردووکیان بە دەستی خوایە تا خوا داخی زیاتر دروست بکات لە دڵی کافراندا کە بزانن هیچ بە دەستی ئەوان نیەو هەموی هەر بەد ەستی خوایە، جا هەم بۆ ترسان‌و هەم بۆ مژدەش دەفەرموێ: خوا نە چاکەی چاکەکارانی لا ون دەبێت و نە تاوانی تاوانباران چونکە خوای گەورە بینەری ئەو شتانەیە کە ئێوە دەیکەن.

(١٥٧) وەبە ڕاستی ئەگەر ئێوە بکوژرێن لە ڕێگای خوا دا یان بمرن لێخۆشبون‌و ڕەحمەتێکی واتان بۆ هەیە لە لایەن خوداوە کە

وَلَئِن مُّتُّمۡ أَوۡ قُتِلۡتُمۡ لَإِلَى ٱللَّهِ تُحۡشَرُونَ ﴿١٥٨﴾ فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ إِن يَنصُرۡكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمۡۖ وَإِن يَخۡذُلۡكُمۡ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعۡدِهِۦۗ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٦٠﴾ وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَغُلَّۚ وَمَن يَغۡلُلۡ يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٦١﴾ أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَمَأۡوَىٰهُ جَهَنَّمُۚ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٦٢﴾ هُمۡ دَرَجَٰتٌ عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٦٣﴾ لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمۡ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾ أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٦٥﴾

چاکترە لەوەی کە ئەوان کۆی دەکەنەوە لە سەروەتو سامان لە دنیادا واتە ئەگەر نەچویت بۆ سەفەرو نەچویت بۆ جیهادو هەر لە ماڵدا بویت نامریت؟ دەبێ هەر بمریتو هەمومرۆڤ لەم مەرگەدا یەکسانەو کەسی لێ رزگار نابێت، جا ئایا بەو شێوەیە بمریت کە دەستت خاڵی بێت باشە یان زەحمەتو تەلاشی چاکت کێشابێت لە سەر ئاینی خواو بمریت یان بکوژرێیت کەئەو هەمو بەخششەی پەروەردگارت بەرکەوێت؟ تۆ دەبێ هەر بگەڕێیتەوە بۆ لای خواو حیسابت لە گەڵدا بکرێت وەك دەفەرموێ:

﴿١٥٨﴾ئەوسا ئەگەر ئێوە بمرن یان بکوژرێن هەموتان بۆ لای خوا دەهێننەوەو حیسابتان لە گەڵدا دەکات. ئینجا ﷲ نیعمەتێکی تر لە نیعمەتە لە ژمارە نەهاتوەکانی دەخاتە بەر چاوی موسڵمانان بە تایبەتی بۆ پێغەمبەرمان ﷺ کە ئەو خەڵکە لە دەوری کۆبوونەوەو هەروەها بۆ هەر فەرماندەیەکی موسڵمانان لە هەر زەمانێکدا ئەگەر چەند کەسێك لە دەوری کۆبوەوە با بزانێت کە ئەوە رەحمەتی خوا بوە نەك زرنگیو لێهاتووی خۆیو دەفەرموێ:

﴿١٥٩﴾ دەی بە هۆی رەحمەتی خواوە کە تۆ نەرم بویت بەرامبەر بە ئەوانو بە نەرمی رەفتارت کرد لەگەڵ خاوەن باوەڕان دا ئەی محمد ﷺ ئەگەر تۆ ئینسانێکی وشكو دڵ رەق بویتایەخەڵك لە چوار دەورت دەردەچوون ئەمە خوایە کە تۆی وا دروستکردوە کە ئاوەها نەرم بیت کەواتە دەی وەکو ئەوەمان پێ دایت تۆش ئا ئەم رەفتارەجوانانە لە گەڵ ئەواندا ئەنجام بدە بۆ ئەوەی زیاتر بلکێن

بە یەکەوە **یەکەم**: لە تاوانێك کە دەیکەن لە سەریان زیاد مەکەو چاوپۆشیان لێ بکە ئەگەر حەدی دیاری نەبو. ئەمەش دژی رەفتاری ئەو داعیە موسڵمانانەن کە عەیبێك دەبینن لە برای موسڵمانی لە باتی داپۆشینی دەیکەن بە قاڵو بە خەڵکی تری دەڵێن بە راستی ئەمە سیفەتی مرۆڤی موسڵمان نیە.

**دوهەم**: دوعای لێخۆشبوونشیان بۆ بکە باخواش لێیان خۆش بێت. **سێیەم**: لەکاتی ئیشو کاروباریان دا راوێژیان لە گەڵدا بکە، چونکە ئەگەر پرسو رات پێ کردن سیقەیان بۆ پەیدا دەبێتو هەست بە لێپرسراوی خۆیان دەکەن، ئەم سی سیفەتە پێویستە لەهەمو فەرماندەیەکی موسڵماناندا هەبێت. جا ئەگەر فەرماندە ئەو ئیشانەی ئەنجام داو دی رەئی خۆی راسترو دروسترە با لە سەر رەئیەکەی خوی بڕوات وەك دەفەرموێ: ئەگەر تۆ خۆت بڕیاری تەواوت دا لە سەر ئەو ئیشە، بیکەو پشتت ببەستە بە ﷲ و گوێ مەدە بە کەسی تر. بە راستی ﷲ ئەو کەسەی کە پشتی پێ دەبەستێت خۆشی دەوێت. ئەم فەرمانەی خوای گەورە لەوانەیە لە بەر ئەوە بوبیت کە دوای ئەو شکستە ئیتر پێغەمبەرﷺ هاتبێ بە دڵیدا کە ئیتر پرسو رایان پێ نەکات خوای گەورە دەفەرموێ: ئەو رەوشتە شتێکی زۆر بە نرخە بە تۆمان داوەو هەمیشە سوودی لی وەربگرە. ﴿فَظًّا﴾ قسە ناخۆشو قسە رەق، ﴿غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ﴾دل رەقو بەد خو.

وە لە بارەی مەشوەرەتەوە ئایا واجبە یان سونەت زانایان دوو قسەن، هەندێك بە واجبی دەزانن و چەندین بەڵگەیان هەیەو هەندێکی تر بە سوننەتی دەزانن‌و ئەوانیش چەندین بەڵگەیان هەیە کە لە پەڕاوە فیقهەکاندا بە درێژی باسکراوەو من رای دووهەمیان بە نزیکتر دەزانمو هەر خوایش زانایە. وە ئەو کەسەی کە پرسو رای پێ دەکرێت دەبێ راستو دەمو دەس پاك بێت، ئەبو هورەیرە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {الْمُسْتَشَارُ مُؤْتَمَنٌ / ابوداود، صححه الالبا / واتە راوێژ پێ کراو ئەبێ ئەمین‌وباوەڕ پێکراو بێ} جا ئەو بڕیار دانەی پێغەمبەر ﷺ دەگونجێت بەم مانا بێت واتە هەر کاتێ پرسو رات کردو بە هەموتانەوە بڕیاری لە سەر درا تۆیش ئیتر مەترسەو دەست بدە ئیشەکەو پشت ببەستە بەخوا، وە دەگونجێ ئەگەر شتێك خۆت بە چاکت زانی، بێ راوێژ کردن بیکەو پشت ببەستە بە خوا بەم مانایە دەستی فەرماندە والاووکراوە تر دەبێت لە ئیشو کاریاو هەمو ئیشەکانی نابەستێت بە راوێژ کردنەوە ئەمە ئەگەر چی بۆنێکی دیکتاتۆری لێ دێت، بەڵام چونکە فەرماندەی موسڵمانان شەرع دانەر نیەن بەڵکو جێ بە جێ کەری فەرمانەکانی شەرعن‌و پەیڕەوی کردنی ئەوان کاتێك پێویستە کە لە شەرع لانەدەن بەڵکو دەبێ بڕیارەکانیان هاوتا بێت لە گەڵ شەرع دا جا ئیتر

پێویست ناكات دووبارە ببەسرێت بە پرسو رای خەڵكیشەوە، ئەگەر چی پرسو را كردن سوننەتێكەو تا بكرێت باشترەو بە سود ترەلەبەر ئەوهۆیانەی كەباسمانكردن، بەڵام لە هەندێ كاتدا پرسو را دەبێ بە هۆی فەوتاندن یان دوا كەوتنی ئیشێكی پێویست، شەڕی پاشگەزبوانو شەڕی نەدانی زەكاتو ناردنی سوپای ئوسامەی كوری زەید بێ پرسو را، بەڵكو دژایەتیشی كرا چەند بەڵگەیەكی بە هێزی ئەم قسانەمانە هەر خوایش زانایە.
ئینجا ﷲ سرنجمان بۆ سەرچاوەی سەركەوتنو ژێر كەوتن رادەكێشێو دەفەرموێ:

(١٦٠) ئەگەر ﷲ یارمەتی ئێوە بدات هیچ كەس سەرناكەوێت بە سەرتانداو ئەگەر ئەو ئێوە سەر شۆڕبكاتو بتان شكێنێت كێ هەیە یارمەتی ئێوە بدات پاش خوا؟ ئاشكرایە هیچ كەسێكی تر نیە دەی تەنها پشت بە خوا ببەستن ئەی خاوەن باوەڕان، چونكە هەمو شت هەر بە دەست خۆیەتیو پشت بە هێزو ژمارە نەبەستن ئەگەر چی ئەوانەش ئەسبابنو پێویستە ئامادە بكرێن وەك لە سورەتی ئەنفال /٦٠دا دەفەرموێ:﴿ خۆتان ئامادە بكەن بۆیان بە هەرچی لە تواناتاندا هەیە﴾ دەڵێن لە شەڕی بەدرا پارچەیەك قوماشی سوور لە ناو غەنیمەتدا نەماو وتیان: لەوانەیە پێغەمبەر هەڵی گرتبێ خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوەو فەرموی:

(١٦١) بۆ هیچ پێغەمبەرێك نیە كەوا خیانەت بكاتو هەر كەسێك خیانەت بكات چ پێغەمبەرو چ غەیری ئەو رۆژی قیامەت بەو خیانەتەوە دێتو حیسابی لە گەڵدا دەكرێت لە پاشان هەمو كەسێك چ پێغەمبەر بێت چ پیاوێكی عادی پاداش یان سزای ئەوكردارەی خۆی پێ دەدرێت وئەوان ستەمیان لێ ناكرێت..
پێویستە ئەوە بزانین كە پێغەمبەرﷺ وەكو كەسێك لەموسڵمانانە سەبارەت بە دەسكەوتەكانی جەنگ وبێجگە لەوبەشەی كە خوا بۆی داناوە هیچی تری هەڵنەدەگرت تا وا گومان نەكەن كە پێغەمبەر ﷺ ئەم شەرە بۆ خۆی دەكات یان بۆ زیاد كردنی ماڵو سەروەتی خۆی دەیكات نەخێر وانیە ئەگەر هاتو ئەو شتێك بە پێچەوانەی ئەمری خوا ئەنجام بدات ئەویش وەكو ئێوە دادگایی دەكرێت. بەم شێوەیە ﷲ موسڵمانانی ترساند لە گومانی خراپ بردن بە پێغەمبەر ﷺ.

(١٦٢) دەی پاش ئەوەی كە پاكی پێغەمبەرتان زانی ئایا دەگونجێت ئەوكەسەی كە پەیڕەوی ڕەزامەندی خوا بێتو ئەو كەسەی كە خوا غەزەبی لێ گرتبێت وەك یەك بن؟ كە ئەو شوێنی جەهەننەمە و پیسترین شوێنە جەهەننەم واتە پێغەمبەر ﷺ كە هەمیشە هەر بە شوێن ڕەزایەتی خودا دا دەڕوات وەك ئەو كەسانە تەماشا بكەن كە ترسیان لە خوا نیەو هەمو حەرامو حەڵاڵێك تێكەڵاو دەكەن؟ نەخێر نابێ ئەوانە وەكو یەك بن.

(١٦٣) ئەوخەڵكە خاوەنی چەندین پلەی جیا جیان لە لای ﷲ هەیە بۆ دۆزەخو لاخواروی دۆزەخ، هەیشە بۆ بەهەشتو جێگابەرزەكانی، وە خوا بینەرە بەوەی كە ئەوان دەیكەنو هیچی لێ ون نابێت.
ئینجا باسی پێغەمبەرمان ﷺ بۆ ئەكات كە ئەو پێغەمبەرە لە نەوەی ئادەمیزادەو هەروەكو باقی خەڵكی تر هەستی خۆشیو ناخۆشیو ساردیو گەرمیو برسیو تینوی دەكات، چونكە ئەگەرلە فریشتە یان پەری بوایە، بەشەر جێگای ڕەخنەی دەبوو دەیتوانی بڵێ: ئێمە وەكو ئەومان پێ ناكرێتو ئەو ڕەگەزێكی ترەو ئێمەش ڕەگەزێكی ترین، كەواتە ئەمە نیعمەتێكی زۆرگەورەیە بۆمرۆڤ بۆیە ﷲ دەفەرموێ:

(١٦٤) بەراستی ﷲ منەتی نایە سەر خاوەن باوەڕان، كەی؟ ئەو كاتەی كە لە نەفسی خۆیان پێغەمبەرێكی بۆ ناردن كە ئایەتەكانی خوا كە قورئانە دەی خوێندەوە بە سەریانداو لەبت پەرستیو ڕەوشتی ناپەسەند پاكی دەكردنەوەو فێری ئەم قورئانە و دانایی دەكردن، وە شارەزای ڕەوشتی بەرزی دەكردن هەر چەند ئەوان لە پێشدا لەم بارەیەوە لە گومڕاهیەكی ئاشكرا دابون و هیچیان نەدەزانی. ئینجا ﷲ دەمانباتەوە سەر باسەكەی جەنگی "ئوحود"و دەفەرموێ:

(١٦٥) ئایا ئێوە هەر خەفەتو پەژارەتان هەیە لەوەی كە ئێوە توشی موسیبەت بوون لە ئوحودا و حەفتا كەستان لێ شەهید بوو بە راستی ئێوە دوو بەرامبەری ئەوە زیانتان گەیاند بە كافران لە بەدر دا كە حەفتا كەستان لێ كوشتنو حەفتایشتان لێ دەسگیر كردن، جا ئەگەردەڵێن بۆچی ئێمە دوچاری ئەم بەڵایە بوین ئێمە لە بەدرا ئاوەها بوین بۆ دەبێ لێرەدا ئاوەها بین؟! ﷲ دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: لە بەر خۆیان وایان لێهات ئەگینا ئێمە لە سەرەتاوە ئەوەی كە خۆتان پێتان خۆش بوو پێمان دان، بەڵام بە هۆی ئەوەی كە خۆتان سەرپێچی ئەمری پێغەمبەری خواتان كرد و ناكۆكیتان تێ كەوتو ترس كەوتە دڵتانەوەو ئەمەتان بە سەر هات بە راستی خوا خاوەنی دەسەڵاتە بە سەر هەمو شتێكدا، وە خوا دەتوانێت هەمو شتێك بكات و دەتوانێت موسڵمان شەڕ نەكاتو كافر بشكێنێت بەڵام بڕیاری خوا وانیە بڕیاری خوا ئەوەیە كە موسڵمانانو كافران شەڕ بكەن ئینجا هەندێ جار سەركەوتن بە كافران بدات هەتا بە چاكی ریزی موسڵمانان پاك بكاتەوە. ئینجا بە دڵنیاییەوە خوا خاوەن باوەڕان سەر دەخات، لە ریوایەت دا هاتوە كە ئەو حەفتا كەسەی لێرە شەهید بوون تۆڵەی

وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٦٦﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ وَقِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ هُمۡ لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ يَقُولُونَ بِأَفۡوَٰهِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يَكۡتُمُونَ ﴿١٦٧﴾ ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ وَقَعَدُواْ لَوۡ أَطَاعُونَا مَا قُتِلُواْۗ قُلۡ فَٱدۡرَءُواْ عَنۡ أَنفُسِكُمُ ٱلۡمَوۡتَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٦٨﴾ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴿١٦٩﴾ فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿١٧٠﴾ ۞يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٧١﴾ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ﴿١٧٣﴾

ئەوەبوو كە لە بەدردا حەفتاكەسیان گرت نەیان كوشتن‌و فیدیەیان لێ وەرگرتن _ئیبنو كەسیر.

﴿١٦٦﴾ ئەوەی كە دوچارتان بو ئەو رۆژەی ئەو دوو كۆمەڵە گەیشتن بە یەك كە لە سەرەتاوە پیرۆزیتان بە دەست هێناولە پاشان شكەستتان خوارد ئەوسا ئەوە بە ئیرادەو ئیزنی خوا بو هەتا دەركەوێت ئیماندارانی راست‌و دروست.

﴿١٦٧﴾ وە تا دەركەوێت ئەو كەسانەی كە موناففقن‌و دووڕون، خۆ بێژرا بەعەبدوڵای كوڕی ئۆبەی‌و هاودەستانی كە لە ئوحود گەڕانەوە وەرن شەڕ بكەن لە رێگای خوادا یان پارێزگاری بكەن‌و دوعا بكەن‌و ژمارەی موسڵمانان زیاد بكەن وتیان: ئەگەر ئێمە بزانین كە شەڕە ئێمەش لە گەل ئێوەدا دەبوین دەڵێن: كاتێ كە عەبدوڵا گەرایەوە بە خۆی‌و موناففقەكانی رەفیقی، عەبدوڵای كوڕی عەمر باوكی جابر چوو بە شوێنیاندا وئەو قسانەی لە گەڵدا كردن، بەڵام نەگەڕانەوە چونكە ئەوان ئەو رۆژە لە بێ باوەڕیەوە نزیك تر بوون هەتا ئیمان كەبە دەمیان شتێك دەڵێن كە ئەو شتە نیە لە ناو دڵیاندا، وە ﷲ زاناترە لە خۆیان بەوەی كە ئەوان دەیشارنەوە لە ناو دڵیاندا. ئەم موناففقانە تەنها بە خۆ دزینەوەش رازی نەبوون بەڵكو دەیان قسەی ناڕەوایان دەكرد بۆ ئازار دانی خاوەن باوەڕان وەكو لە پێشدا هەندێكی باسكرا.

﴿١٦٨﴾ ئەوكەسانەی كە بە براكانیان دەوت ئەگەر ئەوان بە گویی ئێمەیان بكردایە و نەچونایە بۆ شەڕ نەدەكوژران جاخوا دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: دەی ئەگەر زیرەكن‌و راست دەكەن با مەرگ لە خۆتان لابدەن، ئینسان هەر دەبێ بمرێت، بەڵام مردن دوو جۆرە مردنی بەئامانج‌و مردنی بێ ئامانج ئەوانەی كە دوای دنیا كەوتوون نین لە بیری پاشەرۆژداو دەمرن‌و بێ ئامانجن لەو مردنەدا، مردنی بە ئامانج مردنی ئەو كەسانەیە كە دنیا دەناسن‌و دەزانن بۆ تاقیكردنەوە دروستكراون‌و قۆڵی مەردانەی لێ هەڵدەكەن‌و لە هیچ ئیشێكی چاك كەم تەرخەمی ناكەن‌و بۆ ئەنجامدانی بڕیارەكانی خواو پێغەمبەرەكەی لە هیچ كۆسپێك سڵ ناكەن تا لەو پێناوەدا سەری خۆیان دادەنێن‌و دەچنەوە بەردەم بارەكای خوای خۆیان‌و خوایش بەو كەسانە دەفەرموێ:

﴿١٦٩﴾ هەرگیز گومان نەبەن بەوانەی كە كوژراون لە رێگای خوادا كە ئەوانە مردون نەخێر ئەوانە زیندون‌و لای خوای خۆیان رزقیان هەیە. ئەمە زۆر بە هێزترە لەوەی كە لە سورەتی بەقەرە ئایەتی سەدوپەنجاوچوار دا هاتوە كە دەفەرموێ: ﴿وَلاَ تَقُولُوا/ نەڵێن﴾ لێرە دەفەرموێ: گومانیش نەكەن لەوانەیە هەندێك لە موسڵمانان لە بەر خاتری رێز بۆ شەهیدەكان بڵێن: شەهید بوون، بەڵام لە دڵیاندا شتێك ببێت، خوا دەفەرموێ: هیچ گومانێكتان نەبێت ئەوانە نەمردون ئەوانە زیندون، چۆن؟ چونكە حەیاتی ئینسان بریتیە لە دوو شت یەكێكیان خواردن‌و ئیسراحەتە ئەوی تریان بریتیە لە جموجۆڵ‌و ئیش كردن. ئەو كەسەی كە شەهید دەبێت ئەوەیە بە دەقی قورئان﴿عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ /آل عمران: ١٦٩ /رزقیان پێ دەدرێت لە لایەنی خوای خۆیانەوە﴾

جا ئەگەر چی شەهیدان لەم ژیانە كۆتایەی دنیادا لە بەر چاو نەماون، بەڵام بێ گومان گیانە شیرینەكەیان زیندوەو رۆزی پێ دەدرێت لەو ئارامگایەی كەتێیدان. ئیبنو جەریر لە ئەنەسی كوری مالیكەوە بۆمان دەگێڕێتەوە دەربارەی ئەو یارانەی پێغەمبەر ﷺ كە رەوانەی كردن بۆ لای خەڵكی (بیری مەعونە) دەڵێ نازانم چل یان حەفتا كەس بوون وە لە سەر ئەو ئاوە (عامر)ی كوڕی (توفەیل) ی جەعفەری لێ بو، ئەو كۆمەڵە یارەی پێغەمبەر ﷺ چون هەتا گەیشتنە ئەشكەوتێك كە ئەینواڕی بە سەر ئەو ئاوە داو لەوێدا دانیشتن هەندێكیان بە هەندێكیان وت كامتان دەتوانن ئەم نامەی پێغەمبەر ﷺ ببەن بۆ ئەو خەڵكە ئەنەس وتی وائەزانم كە: حەرامی كوڕی مەلحان ی یارمەتی دەر وتی: من نامەی پێغەمبەریان ﷺ بۆ دەبەم، جا چو هەتا نزیكی ئاوەدانیەكەی ئەوان بویەوەو لە بەردەم ماڵەكاندا خۆی حەشارداو

ئینجا وتی: ئەی خەڵکی (بیری مەعونە) بە راستی من رەوانە کراوی پێغەمبەری خوام بۆ لای ئێوە (اشهد ان لا اله الا الله وان محمدا عبده ورسوله) دەی ئێوەیش باوەڕ بهێنن بە خوا بە پێغەمبەرەکەی. پیاوێك لەوان بە رمێکەوە بۆی چوو دای لە کەلەکەی‌و لە کەلەکەی تریەوە دەرچوو حەرام کە ئەوەی دی وتی:"الله اکبر فزت ورب الکعبة/ خوا لە هەمو شت گەورترە سوێند بە خوای کەعبە سەرکەوتم" ئینجا بە رێگای ئەودا رۆیشتن تا گەیشتنە رەفیقەکانی لەو ئەشکەوتەداو عامری کوڕی توفەیل هەمویانی شەهید کرد. ئیسحاق دەڵێت ئەنەسی کوری مالیك قسەی بۆ کردم: کە خوا دەربارەی ئەوان چەند ئایەتی قورئانی رەوان کرد کەداوایان کردبو لەخوا کە ئەم روداوەی ئەوان بە پێغەمبەر ﷺ بگەیەنێت کەوتیان: لە باتی ئێمەدا بە گەلەکەمان بگەیەنن کە ئێمە گەیشتین بە خوای خۆمان‌و ئەو رازی بوو لە ئێمەو ئێمەش رازی بووین لەو) لە پاشان ئەمە سڕایەوەو بەرز کرایەوە دوای ئەوەی کە ماوەیەك بوو ئێمە دەمان خوێندەوە جا خوا ئەمەی دابەزاند ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴾ آل عمران: ١٦٩ ئیمامی مسلم بۆمان باس ئەکات کە مەسروق دەڵێت: سەبارەت بەم ئایەتە پرسیمان لە عەبدوڵا وتی ئێمەیش پرسیارمان کرد لە بارەیەوە فەرموی: {أَرْوَاحُهُمْ فِي جَوْفِ طَيْرٍ خُضْرٍ لَهَا قَنَادِيلُ مُعَلَّقَةٌ بِالْعَرْشِ تَسْرَحُ مِنْ الْجَنَّةِ حَيْثُ شَاءَتْ ثُمَّ تَأْوِي إِلَى تِلْكَ الْقَنَادِيلِ فَاطَّلَعَ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ اطِّلَاعَةً فَقَالَ هَلْ تَشْتَهُونَ شَيْئًا قَالُوا أَيَّ شَيْءٍ نَشْتَهِي وَنَحْنُ نَسْرَحُ مِنْ الْجَنَّةِ حَيْثُ شِئْنَا فَفَعَلَ ذَلِكَ بِهِمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ فَلَمَّا رَأَوْا أَنَّهُمْ لَنْ يُتْرَكُوا مِنْ أَنْ يُسْأَلُوا قَالُوا يَا رَبِّ نُرِيدُ أَنْ تَرُدَّ أَرْوَاحَنَا فِي أَجْسَادِنَا حَتَّى نُقْتَلَ فِي سَبِيلِكَ مَرَّةً أُخْرَى فَلَمَّا رَأَى أَنْ لَيْسَ لَهُمْ حَاجَةٌ تُرِكُوا/ گیانی ئەوان لە ناو لەشی باڵندەیەکی سەوزدایە کە چرایەکی بەسراو بە عەرشی هەیە، دەسوڕێتەوە لە بەهەشت دا هەر کوێی دەوێ بە ئارەزۆی خۆی لە پاشان دەگەڕێتەوە لای ئەو چرایە لەو کاتەدا خوا خۆی پێشان دان بەو شێوەیەی کە خۆی دەزانێت: فەرموی: چیتان پێ خۆشە؟ وتیان چ شتێکمان پێ خۆش بێت ئێمە لە بەهەشت دا بە ئارەزۆی خۆمان دەسوڕێینەوە؟ سێ جار خوای گەورە ئەم قسەی لە گەڵدا کردن، کاتێ دییان کە وازیان لێ ناهێنرێت هەتا داوای شتێك نەکەن، وتیان: ئەی پەروەردگارمان دەمانەوێت کە زیندومان بکەیتەوە هەتا جارێکی تر بکوژرێینەوە لە سەر رێبازەکەی تۆ، دوای کە زانرا بێجگە لەو داوایە داوایەکی تریان نیە وازیان لێ هێنرا} جابیر دەڵێ کاتێ باوکم شەهید بو لە ئوحوددا هەر سەرم دەدێرایەوەو دەگریام، یارەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرگریان لێ دەکردم، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بەرگری نەکردم جا فەرمانی دا کە بەرزکرایەوە و لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ گویی لەدەنگی گریان بو فەرموی:{مَنْ هَذِهِ فَقَالُوا بِنْتُ عَمْرٍو أَوْ أُخْتُ عَمْرٍو فَقَالَ وَلِمَ تَبْكِي فَمَا زَالَتْ الْمَلَائِكَةُ تُظِلُّهُ بِأَجْنِحَتِهَا حَتَّى رُفِعَ/ متفق علیه/ئەمەکێیە؟ وتیان کچی یان خوشکی عەمرە جافەرموی دەی بۆ دەگریت؟ ئەوە فریشتەکان بێ پسانەوە بە باڵەکانیان سێبەریان بۆ دەکرد هەتا بەرز کرایەوە} باوکی جابیر ئەو عەبدوڵایە بو کە بانگی کردە عەبدوڵای کوڕی ئوبەی‌و ئامۆژگاری کرد کە نەگەڕێتەوە جا وائەم گەیشت بەو پاداشتە گەورەیەو ئەویش بەو شێوەیە سەر شۆڕی هەردوو دنیا بو، بەڵێ شەهید زیندون‌و بەو مەرگەی ژیانی هەتا هەتایی بۆ خۆی بە دەست دێنێت‌و راستی‌و دروستی بیر وباوەڕەکەی دەچەسپێنێ‌و یارەکانی پاش خۆی گەرم دەکات لە سەر خەبات‌و تێکۆشان‌و گیان فیدایی‌و شادمان‌و دلخۆشن بە ئیش‌و بە پاداشتەکانیان وەکو لێرەدا دەفەرموێ:

(١٧٠) زۆر کەیفخۆش‌و شادمانن بەو بەخششەی کە الله بە گەورەیی خۆی پێی داون‌و مژدە دەدەن بەوانەی کە پێیان نەگەیشتون و هێشتا شەهید نەبون کە بۆ ئەوان هیچ ترسێك نیە و ئەوان ئیترهیچ پەژارەیەکیان نابێت.

(١٧١) مژدە دەدەن بە نیعمەتێکی گەورەلەلایەن خودا وەو زیادە بەخشینیش‌و بەوەی کە بێگومان بن کە خوا پاداشتی خاوەن باوەڕان زایە ناکات.

جابیر دەڵێ: پێغەمبەری خوا جارێك تەماشای کردم‌و فەرموی: بۆ وا داماویت؟ جابیر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ باوکم شەهید بووەو ماڵ‌و منالێ‌و قەرزێکی زۆر کە لای بوە بە جێماوە بۆم‌و حەوت خوشکی گەورەم هەیە، بۆیە ئاوەها داماوم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی ئایا پێت بڵێم کە خوا لە گەل هیچ کەسێکدا قسەی نەکردوە مەگەر لە پشتی پەردەوە بێت بە راستی روبەڕو قسەی لە گەڵ باوکتا کردو فەرموی: داوام لێ بکە پێت دەدەم باوکت وتی: داوات لێ دەکەم کە بمبەرەوە بۆ دنیا تا دوبارە لە رێگای خوادا شەڕ بکەم و بکوژرێمەوە، پەروەردگار فەرموی: تازە ئەو گەڕانەوە نابێت، ئینجا باوکت وتی: کە مادام ناگەڕێمەوە دەی ئەم وەزعەی ئێمە بگەیەنن بەوانەی کە ماون لە دنیادا تا بەخیلی بە ماڵ‌و بەگیانیان نەکەن، خواش ئەم ئایەتانەی نارد ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ﴾ ئال عیمران: ١٦٩

کاتێ ئەبو سوفیان لە جەنگی ئوحود دا بەرەو مەکە گەڕایەوە لە رێگا دەستی کرد بە وتو وێژ لە گەل موشریکەکانی رەفیق ی و وتیان: ئێمە ئیشێکی خراپمان کرد موسڵمانانمان تارو مار کردو

فَانقَلَبُواْ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَضۡلٖ لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ﴿١٧٤﴾ إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِۚ إِنَّهُمۡ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗاۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجۡعَلَ لَهُمۡ حَظّٗا فِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٧٧﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۚ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿١٧٨﴾ مَّا كَانَ ٱللَّهُ لِيَذَرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَىٰ مَآ أَنتُمۡ عَلَيۡهِ حَتَّىٰ يَمِيزَ ٱلۡخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِۗ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُطۡلِعَكُمۡ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَجۡتَبِي مِن رُّسُلِهِۦ مَن يَشَآءُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَلَكُمۡ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٧٩﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٨٠﴾

بریندارمان کردن‌و ئیشه‌که‌مان یه‌کسه‌ره نه‌کردووه هه‌موویان هاتنه سه‌ر ئه‌ورایه که بگه‌ڕێنه‌وه بۆ سه‌ر مه‌دینه‌و به ته‌واوی موسڵمانان له به‌ین ببه‌ن جا ئه‌م هه‌واڵه گه‌یشته پێغه‌مبه‌رﷺ بانگی کرده ئه‌و هاوه‌ڵانه‌ی که له ئوحود بوون که ده‌ربچن به شوێن ئه‌و کافرانه‌دا کوتو پڕ هه‌موویان ئاماده بون هه‌رچه‌نده هه‌ندێکیان بریندار بوون به‌و برینداریه‌شه‌وه هاتنه خزمه‌تی پێغه‌مبه‌رﷺ تا له گه‌ڵی دا بڕۆن، ئینجا خوا باسی ئه‌و موسڵمانانه ده‌کات‌و ده‌فه‌رموێ:

﴿حَرَّمَ﴾ ئه‌وکه‌سانه‌ی که وه‌ڵامی خواو پێغه‌مبه‌ری خوایانﷺ دایه‌وه پاش ئه‌وه‌ی که بریندار ببوون، ئینجا خوا مژده‌یان ده‌داتیٚ‌و ده‌فه‌رموێ: بۆ ئه‌و که‌سانه‌ی که چاکه‌یان کردوه له‌وان‌و له خوا ترساون پاداشتێکی زۆر گه‌وره‌یان بۆهه‌یه. جا پێغه‌مبه‌ر ﷺ بێ وه‌ستان تا ناوچه‌ی (حه‌مرائو لئه‌سه‌د) رۆیشت‌و له‌و کاته‌دا قافڵه‌یه‌کی بازرگانی (عبدالقیس) ده‌هات بۆ مه‌دینه ئه‌بو سوفیان هه‌ندێ پاره‌ی پێدا که دیعایه‌ی بۆ بکات‌و موسڵمانان بترسێنێت ئه‌وه‌ته خوا ده‌فه‌رموێ:

﴿١٧٣﴾ ئه‌وکه‌سانه‌ی که هاتن‌و پێیان وتن: قوره‌یش دووباره هێزێکی گه‌وره‌ی کۆ کردوته‌وه‌و ده‌یه‌وێت دووباره بێته‌وه سه‌رتان جا له‌و حاڵه‌ته شکه‌ست وسه‌ختەدا ئه‌وان نه‌ترسان‌و وتیان: خوا به‌سه بۆ ئێمه، وه ئه‌و باشترین پشتیوانه. به‌م شێوه‌یه باوه‌ڕه‌که‌یان زیاترو به تین تر بوو.

﴿١٧٤﴾ جا به بۆنه‌ی ئه‌م هه‌ڵوێسته جوانه‌ی که هه‌یان بوو ئه‌و وه‌زعه‌یان له سه‌ر لاچوو خوا له باتی ئه‌و ناخۆشیانه نیعمه‌تێکی فره‌وانی پێدان ئه‌وه‌بو له‌م غه‌زای (حه‌مرائو الئه‌سه‌د) دا موسڵمانان توشی قافڵه‌یه‌کی بازرگانی بوون‌و کڕین وفرۆشتنیان کردو سودێکی باشیان ده‌ست که‌وت و هیچ خراپه‌یه‌کی تریان توش نه‌بو له‌و سه‌فه‌ره‌دا وه ئه‌وان هه‌ربه‌دوای ره‌زامه‌ندی خوا دا بوون و خواش خاوه‌نی به‌ره‌که‌ت‌و سامانێکی گه‌وره‌یه. وشه‌ی﴿فَضۡلٖ﴾زیاتر مه‌به‌ستی ماڵه. جا ئه‌و هه‌ڕه‌شه‌و گوڕه‌شه‌ی ئه‌وانه نه‌یتوانی موسڵمانان سست‌و لاواز بکات به‌ڵكو به پێچه‌وانه‌وه زیاتر موسڵمانان وره‌یان به‌رزتر بویه‌وه‌و ئه‌و هه‌ڕه‌شه‌و گوڕه‌شه‌یان به فرت‌و فێڵی شه‌یتان‌و شه‌یتان سیفه‌تان زانی‌و گوێیان نه‌دایه هه‌روه‌كو خوا ده‌فه‌رموێ:

﴿١٧٥﴾ ئاگاتان لێ بێت ئه‌وه شه‌یتانه ده‌یه‌وێت ئێوه له دۆسته‌کانی خۆی بترسێنێت جا ئێوه نه‌ترسن له‌وان‌و ئه‌گه‌ر ئێوه باوه‌ڕدارن له من بترسن. چونکه ئێوه دوستی خودان و خودا خۆی به‌سه بۆ دۆسته‌کانی وه‌کو له سوره‌تی (زومه‌ر) /٣٦ دا ده‌فه‌رموێ:﴿ئایا خوا به‌س نیه بۆبه‌نده‌کانی خۆی؟﴾

﴿١٧٦﴾ جا با تۆ خه‌مبار نه‌که‌ن ئه‌وانه‌ی که په‌له ده‌که‌ن له کوفرو فه‌ساد دا چونکه‌به راستی ئه‌وانه هیچ زیانێك به خودا ناگه‌یه‌نن‌و خۆیان زیان ئه‌که‌ن. جا بۆ کوێ ده‌چن‌و چۆن له ده‌ستی خوا رزگار ده‌بن؟ ئه‌گه‌ر خوا به‌وو بێ باوه‌ڕانه ماوه ده‌دات ئه‌وه نیشانه‌ی ئه‌وه نیه که ئه‌وان رزگار ده‌بن به‌ڵكو خوای گه‌وره ده‌یه‌وێت له دوارۆژدا هیچ به‌شێكیان نه‌بێت‌و سزایه‌کی گه‌وره‌یان بۆ هه‌یه. ئینجا خوای گه‌وره هه‌واڵمان پێ ده‌دات‌و دڵنیامان ده‌کاته‌وه که:

﴿١٧٧﴾ به‌بێگومان ئه‌وانه که کوفر ده‌کڕن به باوه‌ڕ ئه‌وانه هه‌رگیز هیچ زیانێك له خوا نادەن، وه بۆ ئه‌وان هه‌یه سزایه‌کی ده‌ردناك. هه‌روه‌ها ده‌فه‌رموێ:

﴿١٧٨﴾ با بێ باوه‌ڕان وا گومان نه‌که‌ن که ئێمه مۆڵه‌تیان ده‌ده‌ین ئه‌وه شتێکی چاکه بۆیان ئێمه هه‌ر مۆڵه‌تیان له‌به‌ر ئه‌وه ده‌ده‌ین تا گوناهی زیاتر بکه‌ن، وه بۆ ئه‌وان هه‌یه سزایه‌کی سه‌ختی وا که‌گاڵته‌یان پێ ده‌کات‌و سه‌رشۆڕیان ده‌کات. خۆ ئه‌وان ده‌رناچن له ده‌ستی سزاو نه‌خته نه‌خته دێنه‌وه به‌ره‌و دادگاو سزاو رۆژ به رۆژو هه‌نگاو به هه‌نگاو خۆیان له سزای خوا نزیك ده‌که‌نه‌وه بیانه‌وێ یان نه‌یانه‌وێ. ئینجا موسڵمانانیش با وا نه‌زانن که‌وتیان ئیماندارین ئیتر وازیان لێ بهێنرێت. وه‌کو له پێشه‌وه فه‌رموی:

ئەم سزاو شكستیانەیان بەسەردا دەدەین بۆ تاقیكردنەوەی موسڵمانانو لەخۆبایبونی خوانەناسان. ئینجا ﷲ بە شێوەیەكی رونتردەفەرموێ:

(١٧٩) ﷲ واز لە ئیمانداران ناهێنێت، هەر بەمە كە بڵێن ئێمە ئیمانداریـن لە گەڵ بوونی مرۆڤی دووڕوو هەڵپەرستو گەندەڵدا، هەتا پیس وپاك لە یەك جیا دەكاتەوە، ﷲ ئێوەی ئاگادار نەكردوەتەوە لە سەر شتە شاراوەكان ئێوە نازانن باش كێیەو خراپ كێیە بەڵام بەو شەڕو بەزم وهەرایە ئەوەی كە موسڵمانو پاڵفتە بێت دەردەكەوێتو ئەوەی ناپوختیش بێت دەردەكەوێت، وە بەراستی ﷲ هەڵدەبژێرێت لەناونێردراوەكانی خۆی دا ئەو كەسەی كە ئارەزۆی لێ بێتو شتانێكی پەنامەكیان پێ دەڵێت، دەی ئیمان بێنن بە خواو بە هەمو پێغەمبەرەكانی، وە ئەگەر ئیمانتان هێناو لە خوا ترسان بەو شێوەی كەشیاوبێت ئەوسا بۆ ئێوە هەیە پاداشتێكی گەورە. هیچ كەسێك نیە كە دۆستو دوژمن لە یەك جیا نەكاتەوەو ریزی دۆستانی خۆی پاك نەكاتەوە دەی چۆن دەبێ خوای داناو زانا هەروا بێ تاقیكردنەوەو پاك كردنەوەی ریزی دۆستانی دەستەو سان بێت؟ نەخێر، ئەمەش دەمكوتێكە بۆ ئەو كەسانەی كە ئەگەر موسڵمانێك توشی بەڵایەك هات دەڵێن: ئەگەر پیاوی چاك بوایەو راستی بكردایە وای لێ نەدەهات بە راستی ئەمە قسەیەكی نارەوایەو بۆ چونێكی هەڵەیە، چونكە پرسیاركرا لەپێغەمبەرمانﷺ كە كێ لە هەموكەس تەنگو چڵەمەو گرفتاری زۆری بەسەردا هاتوە؟ فەرموی:{الْأَنبِيَاءُ ثُم الْأَمْثَلُ فَالْأَمثَلُ فَيُبْتَلى الرجُلُ عَلى حَسَبِ دِينِهِ فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلْبًا اشْتَد بَلَاؤُهُ وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقةٌ ابْتُلِيَ عَلى حَسَبِ دِينِهِ فَمَا يَبْرَحُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ حَتى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلى الْأَرْضِ مَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ /الترمذی، صححه الالبا / ئەوەی كە زیاتر لە هەموكەس دوچاری سەختی بوبێت پێغەمبەرانن لە پاشان كێ لەچاكیدالەوان نزیكتر بێت جا هەركەسێك بەگوێرەی ئایینەكەی تاقی دەكرێتەوە جائەگەر لەئایینەكەیدا بتەوبێت تاقیكردنەوەكانی توند ترە، وەئەگەر لەئایینەكەیدا لاوازبێت تاقیكردنەوەكەشی بەگوێرەی ئایینەكەیەتی ئەوسا تاقی كردنەوە لەسەر بەندەی خواناس لاناچێت تاكاتێ بەجێی هێشت بەوسەر زەوییەدا دەڕوات كە هیچ تاوانێكی بەسەرەوەنامێنێت} كەوابو ئەم بۆ چونە بۆ چونێكی هەڵەیە كە بڵێن كابرا ئەگەر موسڵمانە بۆ ئاوەهای لێ هاتوە؟ لە راستی دا بەڵاو موسیبەت بۆ تاقیكردنەوەیەو بەڵكو موسڵمانان زیاتر لەكافران توش دەكات، ئینجا ئەگەر لەو تاقیكردنەوەیە دەرچوو وەكو زێڕێكی پاڵفتە كراو دەمێنێتەوە كەواتە كافران نابێ وا گومان بكەن كە مۆڵەتیان پێ دراوەو تۆڵەیان لێ نەسەنراوە ئیتر خۆشیان رابواردوەو خۆشبەختن ئەوان سزایەكی گەورەیان بۆ ئامادە كراوەو ئێمەی موسڵمانیش ئەگەر راست بكەین پاداشێكی زۆر گەورەمان بۆ دانراوە. بەڵێ بەم تاقیكردنەوەی جەنگی ئوحودە ریزی خواناسان لە موناڧق وە هەڵپەرەستان جیا كرایەوەو بەم شێوەیە شاراوەكانی ئاشكرا كرد تا خاوەن باوەڕان راستو ناڕاست لە یەك جیا بكەنەوە. تا ئێرە باسی جەنگی ئوحود بو، جا ﷲ لەم ئایەتەدا باسی ئەو كەسانە دەكات كە ماڵیان پێ دەدرێتو نایبەخشن لە رێگای خواداو پێیان وایە ئەو دەوڵەمەندیە بە هۆی عیلم وزرەنگی خۆیانەوە دەستیان كەوتوە، قارون ئاسا خۆیانی پێ هەڵدەكێشن بۆیە دەفەرموێ:

(١٨٠) با گومان نەكەن ئەوانەی كەرژدی دەكەن بەوەی كەخوا لەنیعمەتی فەروانی خۆی رژاندویەتی بە سەریانداو بەشی خوای لێ نادەن ئەمە شتێكی چاكە بۆیان نەخێر ئەو ماڵە شەڕو سزایە بۆیان بەم زوانە ئەوماڵەی كە رژدوبەخیلن لەخێروچاكەكردن تێیدا دەكرێ بە تەوقێكو دەكرێتە ملیان لە رۆژی قیامەتدا، وە لەعاقیبەتدا ئاسمانانو زەوی تەنها بۆ خوا دەمێنێتەوەو هەمو زیندەوەرێك دەمرێتو هیچ كەس نامینێت، وە خوا ئاگادارە بەو ئیشەی كە دەیكەن. لە شوێنێكی تردا دەفەرموێ: ﴿ ئەوزێڕو زیوەی كە كۆیان كردۆتەوە دەكرێت بەپارچە ئاسنی گەورەو داغ دەكرێت و دەنرێت بەناوچاوانیانو تەنیشتیانو پشتیانەوەو پێیان دەفەرموێ: ها ئەوەیە كە كۆتان كردوەتەوە بیخۆن﴾ (تەوبە/٣٤ -٣٥) وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:{مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلَا فِضةٍ لَا يُؤَدي مِنْهَا حَقهَا إِلا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفحَتْ لَهُ صَفَائِحُ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِيَ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنمَ فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ كُلمَا بَرَدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِما إِلَى الْجَنةِ وَإِما إِلَى النارِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ فَالْإِبِلُ قَالَ وَلَا صَاحِبُ إِبِلٍ لَا يُؤَدي مِنْهَا حَقهَا وَمِنْ حَقهَا حَلْبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا إِلا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ أَوْفَرَ مَا كَانَتْ لَا يَفْقِدُ مِنْهَا فَصِيلًا وَاحِدًا تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا وَتَعَضهُ بِأَفْوَاهِهَا كُلمَا مَر عَلَيْهِ أُولَاهَا رُد عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِما إِلَى الْجَنةِ وَإِما إِلَى النارِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ قَالَ وَلَا صَاحِبُ بَقَرٍ وَلَا غَنَمٍ لَا يُؤَدي مِنْهَا حَقهَا إِلا إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ لَا يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ وَلَا جَلْحَاءُ وَلَا عَضْبَاءُ تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلَافِهَا كُلمَا مَر عَلَيْهِ أُولَاهَا رُد عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيَرَى سَبِيلَهُ إِما إِلَى الْجَنةِ وَإِما إِلَى النارِ /مسلم وغ ه/ وە هیچ خاوەن زێڕو زیوێك نیە كە حەقی خۆی لێ نەدات مەگەر رۆژی قیامەت هات ئەوپارەو زێڕەی كە كۆیان كردوەتەوەو زەكاتیان لێ نەداوە دەكرێت بە پارچە ئاسنێك كەبەئاگری دۆزەخ

لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿١٨١﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿١٨٢﴾ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾ فَإِن كَذَّبُوكَ فَقَدۡ كُذِّبَ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِكَ جَآءُو بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿١٨٥﴾ ۞ لَتُبۡلَوُنَّ فِيٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ وَلَتَسۡمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَذٗى كَثِيرٗاۚ وَإِن تَصۡبِرُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنۡ عَزۡمِ ٱلۡأُمُورِ ﴿١٨٦﴾

سور کراوەتەوە، تەنشتوناوچاوو پشتی پێ داخ دەکرێت لە ڕۆژێکدا کە ماوەی پەنجا هەزار ساڵە جا هەر کاتێك سارد دەبێتەوە دووبارە داخ دەکرێتەوە هەتا بڕیاری تەواو دەدرێت لەنێوان بەندەکاندا یان بۆبەهەشت یان بۆدۆزەخ، بێژرا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺئەی حوشتر فەرموی: هیچ خاوەن حوشترێك نیە کە حەقی نەدابێت، وەلەوحەقانەشی دۆشینێتی لەرۆژی ئاودانیدا مەگەر بهێنرێت لەرۆژی قیامەتداوراخرێت بۆی لەدەشتێکی تەختو پانوپۆرتر لەوەی کەبوە یەك بەچکەحوشتریشی ون نابێت کەبەسمەکانیان دەیشێلنوقەپی پێدا دەکەن کاتێك کە یەکێکیان دەڕوات ئەوی تریان دەگێڕنەوەسەریان لە ڕۆژێکدا کە ماوەی ئەو ڕۆژە پەنجا هەزار ساڵە هەتا بڕیاری تەواو دەدرێت لەنێوان بەندەکاندا یان بۆبەهەشت یان بۆدۆزەخ ، بێژرا ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەی ڕەشەوڵاخو ماڵات؟ فەرموی: هیچ خاوەنی ڕەشەوڵاخو ماڵاتێك نیە کەحەقی نەدابن مەگەر کاتێ کەقیامەت هات لەدەشتێکی تەخت دا دادەخرێت بۆ ئەو بەسەزمانانەو هیچیان ون نابنو نەشاخ پێچڕاونەشاخ لارو نەشاخ شکاوی تێدایە بەڵکو هەمویان شاخیان ڕاستەوتیژە کە بەشاخانەیان لێیان دەدەنوبە قولەسمەکانیان دەیان شێلن کاتێك کە یەکێکیان دەڕوات ئەوی تریان دەگێڕنەوەسەریان لە ڕۆژێکدا کە ماوەی ئەو ڕۆژە پەنجا هەزار ساڵە هەتا بڕیاری تەواو دەدرێت لەنێوان بەندەکاندا یان بۆبەهەشت یان بۆدۆزەخ} ئابەم شێوەیە سزا دەدرێن. سەبارەت بەوانەی کە ماڵیان هەیەو زەکاتی لێ نادەن فەرموده زۆرە بەڵام ئێمە لێرەدا بەم فەرمودەیەی کە ئەبو هورەیرە دەیگێڕێتەوە دێینەکۆتایی کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {مَنْ آتَاهُ اللَّهُ مَالًا فَلَمْ يُؤَدِّ زَكَاتَهُ مُثِّلَ لَهُ مَالُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ شُجَاعًا أَقْرَعَ لَهُ زَبِيبَتَانِ يُطَوَّقُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ثُمَّ يَأْخُذُ بِلِهْزِمَتَيْهِ يَعْنِي بِشِدْقَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ أَنَا مَالُكَ أَنَا كَنْزُكَ ثُمَّ تَلَا ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ ... ﴾ /البخاری/ هەر کەسێك خوا ماڵی بداتێو زەکاتی نەدات لە ڕۆژی قیامەتدا ئەو ماڵەی بۆ دەکرێت بە مارێکی گەورەی وا کە لە بەر ژاری زۆری کەچەڵەو ددانی تیژی هەیەودەخرێتە ملی لەرۆژی قیامەتدا لەپاشان بەهەردوو کەلاوەی لێوی کابرا دەگرێتو پێ دەڵێت: من ماڵەکەتم، من خەزینەکەتم، لە پاشان ئەم ئایەتەی تا ئاخر خوێندەوە ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ ... ﴾ } ئینجا خوای گەورە قسەیەکی ناشیرینی بێ باوەڕان وئەهلی کتێب ئاشکرا دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٨١﴾ با چاك بزانن کە ﷲ بیستی قسەی ئەوانەی کە دەیان وت: بێگومان کەخوا فەقیرەو ئێمە دەوڵەمەندین بەم زوانە دەی نوسین ئەوەی کە ئەوان وتیانو هەروەها بەناڕەواکوشتنی پێغەمبەرانیش، ئەوانەدێنەوە بەر دەستمانو جەهەنەمیان بۆ داخ دەکەینو پێیان: دەڵێین بچنە ناو ئەو سزایەو بچێژن سزای سوتێنەر. چونکە ئێوە دڵی پیاو چاکانو پێغەمبەرانتان سوتاندوەو واتان دەزانی ئیشی باش دەکەن جا بخۆن عافیەتتان بێت ئەو ئاگرە سوتێنەرە. دەڵێن هەندێك لە کافرەکان کاتێك کە ﷲ فەرموی: کێ هەیە کە قەرزی جوان بدات بە خوا، وتیان: خوا دیارە فەقیرەو داوای قەرزمان لێ دەکات ئا بەم قسە ناشیرینە وەڵامی خوایان دایەوە.

﴿١٨٢﴾ ئەمەش بە بۆنەی ئەو کردارە پیسانەیە کە لە پێشەوە کردوتانە بۆیە وا سزا دەدرێن ئەگینا بەبێگومان خوا ستەم ناکات لە هیچ بەندەیەك بەڵکو خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووەو باوەڕیان بە پێغەمبەران نەهێناوە.

﴿١٨٣﴾ ئەوانەی کە وتیان: بەڕاستی خوا پێی ڕاسپاردوین کە باوەڕ نەهێنین بە هیچ پێغەمبەرێك، هەتا قوربانیەك نەکاتو ئەو قوربانیەش ئاگر نەیسوتێنێ جا ئەگەر ڕاست دەکەیتو تۆپێغەمبەریت دەی قوربانی بکە بابسوتێت تا باوەڕت پێ بکەین ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: خۆ لە پێش منەوە پێغەمبەرانێك هاتن بە چەندین نیشانەی ئاشکراو بەوکارەش کە خۆتان دەیڵێن جائەگەر ڕاست دەکەن دەی بۆ کوشتنتان؟.

(١٨٤)ئەی محمدﷺ ئەگەر تۆ بە درۆدەخەنەوەو باوەڕت پێ ناکەن نارەحەت مەبە چونکە تەنها تایبەتی تۆ نیە ئەم بە درۆ خستنەوەیان بە راستی بێ باوەڕ بون بە پێغەمبەرانی پێش تۆش کە بە چەندین نیشانەی ئاشکراو بە زەبورو بە کتێبی روناک کەرەوە هاتبوون. ئینجا ﷲ هەواڵێکی گشتی رادەگەیەنێتو دەفەرموێ:

(١٨٥)هەموو گیان لەبەرێك تامی مردن دەكاتو کەس لە مردن رزگاری نابێتو پاداشتی خۆتان هەر لە رۆژی قیامەتدا وەردەگرنەوە جا ئەو کەسەی کە دوور خرایەوە لە ئاگری جەهەنمو بخرێتە ناو بەهەشتەوە بە راستی ئەو کەسە خۆشبەختو رزگارەو ژیانی دنیا بێجگە لە کەلوپەلێکی سەرگەرم کەر شتێکی تر نیەوبەم زوانە نامێنێت وەکو لە سورەتی (رەحمان: ٢٦) دا دەفەرموێ: ﴿هەرکەس لەسەرئەم زەوییەدایەنامێنێ﴾.

(١٨٦)بەدڵنیاییەوە کەئێوە لەماڵو لەگیانتاندا تاقی دەکرێنەوەو بەراستیش لەوانەی کە کتێبیان پێدراوە پێش ئێوەو لەوانەش کە هاوەڵیان بۆ خوا داناوە ئێشو ئازارێکی زۆرتان پێ دەگات، وە ئەگەر ئێوە سەبرتان ببێت وبەردەوام بن لە سەر عیبادەتی خواو لە خوا بترسنو دەست نەبەن بۆ خراپە وتاوانو خوا لە خۆتان عاجز نەکەن بە راستی ئەمە بەشێکە لە بەشە گرنگەکانی ئایین. ئەمە لە کاتێکدا دابەزی کە موسڵمانان کۆچیان کردە شاری مەدینەو موشریكو ئەهلی کتێب زۆر تانەو تەشەریان لێ دەدانو دڵی موسڵمانانیان بریندار دەکرد بەم شێوەیە ﷲ دڵخۆشی کردنو فەرمانی پێدان کە چاوپۆشیان لێ بکەنو خۆ بگرن هەتا خوا دەرگایەکتان لێ دەکاتەوە، وە ئەمە دڵخۆشیەکیشە بۆ هەمو موسڵمانان کە دوچاری سزاو ئێشو ئازار دەبن کە بە چاکی هەڵسو کەوت بکەنو خۆ بگرن تا بگەن بەو پلە بەرزە، بەڵام دەبێ خۆگرتن لە ترسنۆکی جیا بکەینەوە، خۆ گرتن ئەوەیە کە ئێوە خوا ناسی راستەقینە ئەنجام بدەنو سڵ لە هیچ کۆسپێك نەکەنو لە بەرامبەر تەنگ وچەڵەمەوە هەراسان نەبنو لە بەرنامەی خۆتان کۆڵ نەدەن، بەڵام ترسنۆکی وەکو ئەمرۆی ئێمەیە کە راستی نەڵێین نەوەك توش ببین ئەوەندە باوەڕمان لاوازەو بێ ئاگاین لە قورئانو وا دەزانین ئەگەر بەو شێوەیە رەفتار بکەینو بتوانین ستەمکاران لە خۆمان رازی بکەین شتێکی ژیرانەو چاکمان کردوە بێ ئاگاین لەوەی کە خوا دەفەرموێ:

(١٨٧) وە بیر یان بخەرەوە ئەو کاتەی کە خوا پەیمانی وەرگرت لەوانەی کە کتێبیان پێ درابو کە دەبێ ئەوکتێبە رۆشن بکەنەوە بۆ خەڵكو نابێ هیچی لێ بشارنەوە کەچی ئەوانە ئەو

وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ وَٱشْتَرَوْاْ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا ۖ فَبِئْسَ مَا يَشْتَرُونَ ﴿١٨٧﴾ لَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفْرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحْمَدُواْ بِمَا لَمْ يَفْعَلُواْ فَلَا تَحْسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٍ مِّنَ ٱلْعَذَابِ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٨٨﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِى ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِى خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿١٩١﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدْخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدْ أَخْزَيْتَهُۥ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿١٩٢﴾ رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعْنَا مُنَادِيًا يُنَادِى لِلْإِيمَٰنِ أَنْ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمْ فَـَٔامَنَّا ۚ رَبَّنَا فَٱغْفِرْ لَنَا ذُنُوبَنَا وَكَفِّرْ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلْأَبْرَارِ ﴿١٩٣﴾ رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ وَلَا تُخْزِنَا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّكَ لَا تُخْلِفُ ٱلْمِيعَادَ ﴿١٩٤﴾

راستیانەیان پشتگوێ خستو لە بیری خۆیان بردەوەو بەو شاردنەوەیە لە دنیادا بەهرەیەکی کەمیان دەست کەوت ئای چ مامەڵەیەکی خراپیان کرد.

جولەکەو گاور هەردووکیان کتێبیان بۆ هاتوەو لە هەمویان پەیمان وەرگیراوە، وە ئێمەش لەم قورئانەدا داوامان لێ کراوە کەئەم راستیانە نەشارینەوە با ئازاریش بدرێین چونکە یان دەبێ هەر موسڵمان نەبین یان دەبێ تاقی بکرێینەوەو راستو ناراست دەرکەوێت، ئینجا خوا هەڕەشە لەوانە دەکات کە راستی دەشارنەوە بۆ ئافەرینو دەفەرموێ:

(١٨٨)گومان نەکەیت ئەو کەسانەی کە کەیف خۆشن بەوەی کە وتویانە لە شاردنەوەی راستیو پێیان خۆشە کە سوپاس بکرێن بەو شتەی کە نەیانکردوە دەی سا گومان نەکەیت کە ئەوە دەبێتە بەرزگارکەریان لە سزا، وە بۆئەوان سزایەکی بەژان هەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ ادعَى دَعْوَى كَاذِبَةً لِيَتكثرَ بِهَا لَمْ يَزِدْهُ اللهُ إلا قِلةً /مسلم/ هەر کەسێك قسەیەکی درۆ بکاتو ناراستێك بەراست دابنێت بۆ ئەوەی خۆی پێ زۆر بکات خوای گەورە بێجگە لە کەمی شتێکی تری پێ نادات}

هەروەها دەفەرموێ:{الْمُتَشَبِّعُ بِمَا لَمْ يُعْطَ كَلَابِسِ ثَوْبَيْ زُورٍ /منفق عليه/ ئەو کەسەی کە خۆی بە تێر پێشان دەدات لە شتێك کە پێی نەدراوە وەك ئەو کەسە وایە کە دوو پۆشاکی روکەشی پۆشی بێت}

دەڵێن هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەبو کە جەماعەتێك هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ ، جا پێغەمبەر داوای شتێکی لێ کردن کە لە کتێبەکەی خۆیاندا نوسرابو ئەوانیش هاتن بە پێچەوانەی ئەوەی کە لە کتێبەکەی خۆیاندا نوسرابو بۆ پێغەمبەریان ﷺ خوێندەوە. ئینجا پێیان وت کە لە کتێبەکەی ئێمە وا نوسراوە جا تاقمێك لە خۆیان سوپاسیان کردن کە ئێوە پیاوی زرەنگو بە شەهامەت بون کە راستیتان شاردۆتەوەو بە محمدتانﷺ نەوتوە جا ئەوانیش بەو سوپاسو هەڵنانەی هاوباوەڕەکانیان زۆر شادمان بون، لەفەرمودەیەکدا هاتوەکە:{ أن رِجَالًا مِنْ الْمُنَافِقِ َ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ كَانَ إِذَا خَرَجَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى الْغَزْوِ تَخَلَّفُوا عَنْهُ وَفَرِحُوا بِمَقْعَدِهِمْ خِلَافَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَإِذَا قَدِمَ رَسُولُ اللهِ ﷺاعْتَذَرُوا إِلَيْهِ وَحَلَفُوا وَأَحَبوا أَنْ يُحْمَدُوا بِمَا لَمْ يَفْعَلُوا فَنَزَلَتْ ﴿ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُوا۟ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُوا۟ ...الآية

﴾ ئالی عیمران: ١٨٨ / لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺ کۆمەڵێك لە منافقەکان هەر کاتێ کە پێغەمبەری خوداﷺ دەردەچو بۆ غەزا خۆیان وەپاش دەدا کە شادمان بون بەودانیشتنانەیان پاش پێغەمبەری خوداﷺجا هەر کاتێ کە پێغەمبەری خوداﷺ دەگەیشتەوەماڵ بەهانەی نەچونیان باس دەکردو پێیان خۆشبوکەسوپاس کرێن لەسەر ئەوەی کە نەیانکردبو جا ﴿ لَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَوا۟ وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُوا۟ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُوا۟ ...الآية

﴾ دابەزی}

لە فەرمودەیەکی پێغەمبەرمانﷺدا هاتوە کە{مَنْ سُئِلَ عَنْ عِلْمٍ عَلِمَهُ ثُمَّ كَتَمَهُ أُلْجِمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِلِجَامٍ مِنْ نَارٍ/الترمذي ٢٦٤٩، قال الالبا :حسن صحيح/ هەر کەسێك پرسیاری زانستێکی لێ بکرێت کەبیزانێتو بیشارێتەوە رۆژی قیامەت لەغاو دەکرێت بە لەغاوێکی ئاگر} ئینجا اللهُ باسی دەسەڵاتو موڵکی خۆی دەکاتو دەفەرموێ:

(١٨٩) وە ئەوەی کە لە ئاسمانانو زەوی دا هەیە هەموی موڵکی خوایە بە کافرو موسڵمانەوە بە گیاندارو بێ گیانەوەو اللهُ دەسەڵاتی بە سەر هەمو شتێکدا هەیە، جا بۆ ئەبێ لێی نەترسێینو بەندایەتی نەکەین؟ بەڵگەیەکی تر لە سەر دەسەڵاتی باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٩٠) بەبێگومان لە دروست کردنی ئاسمانانو زەویداو لە گۆڕاندنی شەوو رۆژدا. کە ئەم شەوو رۆژە بێ پسانەوە بە دوای یەکتردا دێن بە شێوەی دیاری کراو چەندین بەڵگەی گەورەی تێدایە بۆ ئەوانەی کە خاوەنی عەقڵو دەرك بن ﴿أُوْلُوا۟ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴾. کێن خاوەن عەقڵەکان؟

جَزَآءُ خاوەن عەقڵ ئەو کەسانەن کە یادی خوا دەکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو بە راکشانەوە واتە هەمیشە یادی خوا دەکەنو خوایان لە بیر ناچێتەوەو بیر دەکەنەوە لە دروستکردنی ئاسمانانو زەویو تەماشای ئەو هەمو نیعمەتانەی خوا دەکەن کە خوا لەم زەویەدا بۆ ئێمەی داناوەو تەماشای گۆڕانی شەو رۆژ دەکەن کەهەموی لەخزمەتی مرۆڤدایە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ناگونجێت تۆ ئەمەت بێهودە دروست کردبێت پاكو مونەزەهی بۆ تۆ کە ئیشی بێ کەڵك بکەیت، نەخێر ئیشەکانت هەموی لە سەر بناغەی دانایيو زاناییەو ئێمەیش بێ حیسێبو کتێب نین دەی بمان پارێزە لە سزای ئاگرو دەڵێن:

(١٩٢) ئەی پەروەردگارمان بێگومان ئەو کەسەی کە تۆ بیخەیتە ناو ئاگری جەهنەمەوە بەراستی سەرشۆڕو ریسوات کردوە، وە بۆ ستەکاران هیچ یارمەتی دەرێك نییە، واتە خوایە ئێمە لە رێزی ستەمکاراندا دامەنێ، چونکە باوەڕمان وایە هەر کەسێك ستەمکار بێت یارمەتی دەرێکی نیەو شەرمەندەو سەرشۆڕە. ئینجا ئەو ئینسانە ژیرانە درێژە بە پاڕانەوەی خۆیان دەدەن و دەڵێن:

(١٩٣) ئەی پەروەردگارا بەبێگومان کە ئێمە بیستمان بانگ کەرێك بانگی کرد بۆ ئیمان کە لە سەردەمی پێغەمبەرا، پێغەمبەرﷺ خۆی بوەو دوای پێغەمبەریش ﷺ بانگ کەرانی راستەقینەی ئەم ئاینەیە هەتا قیامەت دێت، بانگیان کردینو وتیان باوەڕ بهێنن بە پەروەردگاری خۆتان جائێمەیش باوەڕمان هێنا ئەی پەروەردگارمان لە گوناهەکانمان خۆشبەو تاوانەکانمان بۆداپۆشەو لە گەل ئینسانە چاکەکاندا بمانمرێنە. واتە هەر کاتێ مەرگمان هات مەرگمان وەکو چاکە کاران بێت کە فریشتەکان لەو کاتەدا سەلامیان لێ دەکەن.

(١٩٤) ئەی پەروەردگارمان هەر تۆ دەپەرستین دەی پێمان بدە ئەو بەڵێنەی کە داوتە لە سەر زمانی پێغەمبەرکەت کە بریتیە لە یارمەتی دانو سەرکەوتن بە سەر کافرو ستەم کاران داو بەهشتی هەتاهەتاییە، وە لە رۆژی قیامەتدا سەرشۆڕمان نەکەیت بە بێگومان کە تۆ پێچەوانەی بەڵێنی خۆت ناکەیت ئێمەیش چاوەڕوانی سەرکەوتنی دنیاو سەربەرزی رۆژی دوایت لێ دەکەین، چونکە فەرموتە:﴿ پێویستە لە سەر ئێمە کە یارمەتی خاوەن باوەڕان بدەین ﴾ روم/٤٩،

عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێ: شەوێك لە لای پورم مەیمونەی خێزانی پێغەمبەرﷺ مامەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ هەندێ قسەی

فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَالَّذِينَ هَاجَرُوا وَأُخْرِجُوا مِن دِيَارِهِمْ وَأُوذُوا فِي سَبِيلِي وَقَاتَلُوا وَقُتِلُوا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأُدْخِلَنَّهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ثَوَابًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ وَاللَّهُ عِندَهُ حُسْنُ الثَّوَابِ ﴿١٩٥﴾ لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي الْبِلَادِ ﴿١٩٦﴾ مَتَاعٌ قَلِيلٌ ثُمَّ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمِهَادُ ﴿١٩٧﴾ لَٰكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا نُزُلًا مِّنْ عِندِ اللَّهِ وَمَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ لِّلْأَبْرَارِ ﴿١٩٨﴾ وَإِنَّ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ لَمَن يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُمْ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِمْ خَاشِعِينَ لِلَّهِ لَا يَشْتَرُونَ بِآيَاتِ اللَّهِ ثَمَنًا قَلِيلًا أُولَٰئِكَ لَهُمْ أَجْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿١٩٩﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

سُورَةُ النِّسَاءِ ٤ ١٧٦

کرد لە گەل خێزانی داو لە پاشان خەوت، کاتێ کە سێ بەشی ئاخری شەو هات لە خەو هەستاو دانیشتو تەماشای ئاسمانی کرد فەرمووی:﴿ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴾ پاشان دەست نوێژی گرتو سیواکی کردو یانزە رکات نوێژی کرد لە پاشان بیلال بانگی دا ئێنجا دوو رکاتی تری کردو لە پاشان هاتە دەرەوەو نوێژی بەیانی کرد بۆ خەڵك. ( اری)

﴿١٩٥﴾ جا خوا دەفەرموێ: با دڵنیابن کە من ئیشی هیچ کام لە ئێوە زایە ناکەم چ پیاو بێت چ ژن هەر کەسێك بەراستی ئیشی کرد بۆ خوا بە بێ جیاوازی پاداش دەدرێتەوە جا ئەو کەسانەی کۆچ دەکەن لە بەر خاتری خوا، وە دوور دەکەونەوە لە ماڵو دۆست وخزم وکەسی خۆیانو ئازار دەدرێن لە سەر رێگای منو بۆ خاتری گەیاندنی پەیامی من بە خەڵكو شەڕ دەکەنو شەهید دەکرێن بادڵنیابن کە لە هەموو گوناهانیان خۆش دەبم، وە بەراستی دەیانخەمە ناو بەهەشتانێکەوە کە دەڕوات بە ژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگە ئەمە پاداشتێکە لە لایەنی خوداوەو بە راستی خوا لە لایەتی باشترین پاداش. ئوموسەلەمەی خێزانی پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە پێغەمبەر ﷺکردو وتی:{یا رَسُولَ اللهِ لا أَسْمَعُ اللهَ ذَكَرَ النساءَ فِي الهِجْرَةِ فَأَنزَلَ اللهُ تعالى ﴿فَاسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّي لَا أُضِيعُ عَمَلَ عَامِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ ﴾ /رواه الترمذي.قال الالبا صحيح لە ە/ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم بیستوە کە خوا باسی ئافرەتانی کردبێت لە بارەی کوچ کردنەوە بە هیچ شێوەیەك؟ جا خوا ئەم ئایەتەی رەوانەکرد} بەڵێ مرۆڤ لە روانگەی ساختمانی لەشیەوە دو جۆرەو جیاوازیان هەیە، بەڵام لەزۆرشتدا هاوبەشنو هەریەکەوکارێکی تایبەت بەخۆیشی هەیە بەڵام لەبەرامبەر خواناسیو پەرهیزکاری وپاداشتیانەوە لەلایەن خوداوە هیچ جیاوازیەکیان نیەو هەردووکیان وەك یەك تەماشا دەکات جا ئەوەی کە ئافرەتو پیاو لە هەموو رویەکەوە وەك یەك دەزانێت لە نەفامیدا هیچ جیاوازییەکی نیە لە گەل ئەوانەی کە ئافرەتیان بە بێ گیان زانیوە، چونکە هەردووکیان لە راستی لایان داوەو بە کوێرە رێگادا دەڕۆن هەردوو سەر لێشێواو گومڕان، بەڵێ لە پاداشتی کردەوەی چاك دا هەموو یەکسانن.

(ل) وەڵامی سوێندە واتە سوێند بە خۆم ئەو شتانەیان بۆ دەکەم. پیاوێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پێت چۆنە ئەگەر من بکوژرێم لە رێگای خوادا کەخۆگرو چاوەڕێی پاداش بەمو روم لە شەڕگاوە بێت، پشتم هەڵنەچەرخاند بێت ئایا خوا لە تاوانەکانم خۆش دەبێت؟ فەرمووی:{نَعَمْ إِنْ قُتِلْتَ فِي سَبِيلِ اللهِ وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ/ بەڵێ ئەگەر لە پێناو خوادا بکوژرێیت لە حاڵێکدا کە خوگر بیتو چاوەڕوانی پاداشت بیتو روت لە مەیدانی جەنگ بێتو پشتت تێ نەکردبێت. لە پاش ماوەیەك فەرمووی: كَيْفَ قُلْتَ؟ چونت وت: ئەویش دوبارەی کردەوە پێغەمبەر فەرمووی:{ نَعَمْ وَأَنْتَ صَابِرٌ مُحْتَسِبٌ مُقْبِلٌ غَيْرُ مُدْبِرٍ إلا الدَّيْنَ فَإِنَّ جِبْرِيلَ عَلَيْهِ السلام قَالَ لِي ذَلِكَ/ مسلم وغ ە/ بەڵێ ئەگەر لە پێناو خودا بکوژرێیت لە حاڵێکدا کە خوگر بیتو چاوەڕوانی پاداشت بکەیتو روت لە مەیدانی جەنگ بێتو پشتت تێ نەکردبێت جگە لە قەرز کە جبرەئیل ئێستا ئەمەی پێ وتم}واتە موسڵمان ئەمە ئیشیەتی، بەڵام کافران بە پێچەوانەوە دەوڵەمەندو خاوەن دەسەڵاتن پێویستە ئاگات لە خۆت بێتو دڵ تەنگو خەمبار نەبیت، دەفەرموێ:

﴿١٩٦﴾ ئەو هات وچۆ کردنەی بێ باوەڕان بەم شارو بەو شارەدا لە کاتێکدا کە تۆ لە ماڵو جێگای خۆتیشدا دەر دەکرێیت با نەتخەڵەتێنێ.

﴿١٩٧﴾چونکە ئەوە خۆشیورابواردنێکی زۆر کەمو کۆتایەو بەم زوانە لە دەستیان دەردەچێت لە پاشان شوێنی ئەوان جەهنەمەو پیسترین ئارامگایەکە بۆیان، بەڵام تۆ ئەو بەهەشتەت هەیە. دووبارە ﷻ دڵی خاوەن باوەڕان دەداتەوەو دەفەرموێ:

(١٩٨) بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە تەقوایان هەیەو لە خوای خۆیان دەترسن‌و پەیڕەوی فەرمانەکانی دەکەن بۆ ئەوانە هەیە چەندین باخچە کە لە ژێر ئەو باخچانەدا چەندین جۆگا دەڕوات، بۆ هەمیشەش تێیدادەبن کەئەمەتەنها میوانداریيەکە لە لایەنی خواوە بۆ ئەوان‌و ئەوەی کە لە لای خوایە زۆر چاکترە بۆچاکان.

(١٩٩) بێگومان لەناو ئەهلی کتێب دا کەسانێك هەن کە باوەڕ دێنن بە خواو بەوەی کە ڕەوانە کراوەتە لای ئێوەو بەوەش کە ڕەوانە کراوەتە لای خۆیان، ئەوانە گەردن کەچن بۆ فەرمانەکانی خواو ناکڕن بە نیشانەکانی خوا بەهەرەیەکی کەم‌و هەرگیز نیشانەکانی خوا ناگۆڕنەوە بەهیچ شتێك، بۆ ئەوان هەیە پاداشتێکی گەورە لە لایەن خوای خۆیانەوە، بەبێگومان کە ﷲ زۆر بە پەلەیە بۆ محاسبە کردن‌و زۆر زوو حیساب لە گەڵ خەڵکدا دەکات. جا ئەوەی کە ئیشی چاکی نەکردبێت تازە لەو جێگایەدا هیچ پەلە قاژەیەکی بۆ ناکرێت‌و بە زویی لێکۆڵینەوەو حیساب دوایی دێت. دەی حسابێ بۆ خۆت بکە پێش ئەوەی کە حیسابت لەگەڵدا بکرێت. ئینجا ﷲ ڕو دەکاتەوە خاوەن باوەڕان‌و سەرەتاو کۆتایی سوڕەتەکە دەبەستێت بە یەکەوە، پێشەکی فەرموی: ﴿ﷲ ئەو زاتەیە کە هیچ پەرەستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە بێجگە لە ئەو، ئەو قورئانەی ڕەوانە کردوەتە لای تۆ بۆ مەبەستێکی ڕاستو ڕەواو دان دەنێت بە ڕاستی ورەوایی ئەو پەڕاوانەی پێش خۆیدا﴾

وە باسی جوانکردنی ژیانی بۆ کردین‌و فەرموی ئەوە شتێکی دنیایین‌و پاشە ڕۆژو بەهەشتو ڕەزامەندی خوا کە لە هەمو شت گەورەترە کە ئامادە کراوە بۆ خاوەن باوەڕان‌و تێیگەیاندین تەنها ڕێبازی ئیسلام ڕاستەو چەند شتێکی گەورەو گرنگی پێشاندابن کە بەڵگەن لە سەر دەسەڵاتو توانایی خوا وەك لە دایك بونی عیسا ﷺ بە بێ باوكو یەحیای دا بە زەکەریا ﷺ لە تەمەنێکی پیری‌و نائومێدی دا و تێیگەیاندین کە موڵك ودەسەڵات هەمو بە دەست خۆیەتی‌و بە کێی بداتو لە کێی بسەنێتەوە، وە دەمکوتی جولەکەو گاورو موشریکەکانی کرد کە دەیان وت: ئیبراهیم لە ئێمەیەو هەڕەشەی کرد لەوانەی کە پاشگەز دەبنەوەو باسی فەرز بونی حەجی بۆ کردین‌و داوای لێ کردین کە هەمومان دەست بگرین بە ئاینەکەی خواوەو بەش بەش نەبین‌و تێیگەیاندین کە ئەگەر پیاو بین‌و دەست بگرین بە ئایینە پیرۆزەکەی ئیسلامەوەو فەرمان بدەین بە چاکەو بەرگری بکەین لە خراپە باشترین گەلین لەم جیهانەدا ئینجا بە درێژی جەنگی ئوحودی بۆ باس کردین کە چەندین پەندو ئامۆژگاری تێدا بو، وە زیانێکی گەورەی گیانیشی تێدا بو بۆ موسڵمانان، چونکە بە شێوەی پێویست خۆیان نەگرتو ئێستاش دووبارە سرنجمان ڕادەکێشێت بۆ پێویست بونی ئەو ئارامی‌و خۆڕاگرییە لە سەر پارێزگاری ئایینە پیرۆزەکەی ئیسلام‌و دەفەرموێ:

(٢٠٠) ئەی خاوەن باوەڕان خۆ بگرن بەرامبەر بە ڕوداوەکان کە بەیین بەیین سەرهەڵدەداتو بەردەوام بن لە سەر خۆگرتن‌و بەم مەڵهەمە برینەکان سارێژ دەبن‌و دوژمنانی ناوخۆی مرۆڤ کە بریتیە لە نەفس‌و شەیتان‌و دوژمنانی دەرەوەی کە بریتیە لە مرۆڤە شەیتان سیفەتەکان‌و ستەمکاران‌و تاغوتان سەر شۆڕو ڕسوادەبن‌و وەك بەفری بەهار هەرەس دێنن‌و دەتوێنەوەو لەناو دەچن، وەبەو خۆگرتنە باوەڕداران پاداشتێکی گەورەو گرانیشیا پێ دەدرێت. وەك دەفەرموێ: ﴿خۆگران پاداشتێکی بێ ژمارەیان هەیە﴾ زومەر/١٠ .

وەخۆتان لە مەکۆ بدەن‌و سینگتان بکەن بە سپێر بۆ بەرپەرچ دانەوەی دوژمنانی ئایین‌و یەك دیواری پتەوو بە هێز بن تا دوژمنانتان نەتوانن بێنە ناو وڵاتی ئیسلامییەوەو گیان‌وماڵمان حەڵاڵ بکەن. وەك دەفەرموێ: ﴿ بەرامبەر دوژمنانتان بە گوێرەی تواناتان خۆتان ئامادە بکەن لە هێزو لە ئەسپی بەسراوەی ئامادە کراو تا دوژمنانی خوداو خۆتانی پێ بترسێنن﴾ ئەنفال/٦٠.

لەم بارەیەوە زۆر فەرمودەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ئەم فەرمودەیە باس دەکەین کە دەفەرموێ:{رِبَاطُ يَوْمٍ فِي سَبِيلِ اللهِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَمَوْضِعُ سَوْطِ أَحَدِكُمْ مِنْ الجَنةِ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا وَالروْحَةُ يَرُوحُهَا العَبْدُ فِي سَبِيلِ اللهِ أَوْ الغَدْوَةُ خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا عَلَيْهَا /البخاری/ یەك ڕۆژ خۆ مەکۆ دان لە سەنگەری ڕێگای خوادا باشترە لە هەمو دنیاو ئەوەی کە لە سەریەتی، جێگای توڵی یەکێکتان لە بەهەشتدا باشترە لە هەمو دنیاو ئەوەی کە لە سەریەتی، ڕۆیشتنی تافێکی ئێوارەی بەندە لەڕێگای خوادا یان تافێکی بەیانی باشترە لە هەمو دنیاو ئەوەی کە لە سەریەتی}

ئینجا سەری هەمو سیفەتە چاکەکانمان بۆ باس دەکات وداوامان لێ دەکات کە ئەو سیفەتە بەنرخەمان تێدا بێت‌و دەفەرموێ: وە لە خوا بترسن تا سەر بکەون‌و ڕزگار بن لە دنیا ولە قیامەتدا. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {اتقِ اللهِ حَيْثمَا كُنتَ وَأَتبِعْ السيئةَ الحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ الناسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ/رواه الترمذي وغ ە، حسنه الالبا / لە خوا بترسە لە هەر کوێ دا بیت وە بە دوای خراپەدا چاکە بکە لە ناوی دەبات، وە بەڕەوشتێکی جوان لە ناو خەڵکدا بجوڵێرەوە}.

## ٤ سورەتی نیسا ١٧٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُوا۟ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ وَءَاتُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَتَبَدَّلُوا۟ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِ ۖ وَلَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾ وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا۟ فِى ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُوا۟ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ مَثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۖ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ فَوَٰحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَلَّا تَعُولُوا۟ ﴿٣﴾ وَءَاتُوا۟ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحْلَةً ۚ فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَىْءٍ مِّنْهُ نَفْسًا فَكُلُوهُ هَنِيٓـًٔا مَّرِيٓـًٔا ﴿٤﴾ وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَٰمًا وَٱرْزُقُوهُمْ فِيهَا وَٱكْسُوهُمْ وَقُولُوا۟ لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٥﴾ وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَٰمَىٰ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ ۖ وَلَا تَأْكُلُوهَآ إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا۟ ۚ وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ ۖ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ فَأَشْهِدُوا۟ عَلَيْهِمْ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٦﴾

سورەتی نیسا کە سورەتی چوارەمی قورئانەو لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوەو سەدوحەفتاوشەش ئایەتە، وتراوە بە گوێرەی دابەزین سورەتی نەوەدو سێهەمەو پاش سورەتی **(ا متحنة)**و پێش **(زلزلة)** دابەزیوە. زۆربەی ئایەتەکانی باس لە پەیوەندی خێزانیو دامەزراندنی یەکەم قوتابخانەی مرۆڤایەتی دەکات بە تایبەت کاروباری ئافرەتانو یەکەم سورەتە کە بەتەواوی بناغەی دابەش کردنی کەلەپور رۆشن دەکاتەوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی خەڵکینە بترسن لەو پەروەردگارەتان، کە ئێوەی دروستکردوە لە یەك کەسو لەو کەسەش هاوسەری بۆ دروست کردو لەو دوو نەفەرەش پیاو ژنانی زۆری بڵاوکردەوەو بترسن لەو خوایەی کە ئێوە بە بۆنەی ئەوزاتەوە داوا دەکەن لە یەکترو هەروەها بە بۆنەی رەحمو بەزەییەوە بێگومان کە ﷲ چاودێرە بە سەرتانەوەو هیچی ئێوەی لێ ون نابێت.

لە سەرەتاوە پەروەردگار ئادەمی لە خاك دروست کردوە، پاشان کاتێ ئادەم لە خەوا بو لە پەراسویەکی لای چەپی ئادەم حەوایشی دروست کردوە، ئادەم کە خەبەری بویەوە بە شتێکی جوانی زانیو ئولفەتیان بە یەکەوە گرت، ئینجا لەو هاوسەرە ئەم مرۆڤەی دروست کردوە، وتراویشە کە ئادەم لە حەوا دروست بوە، بە گوێرەی ئەوەی ﴿وَخَلَقَ مِنۡهَا﴾ (ها) بۆ مێینەیە، مانای وایە لە پێشەوە مێ یەکە دروست بوە بیریان لەوە نەکردوەتەوە کەوشەی ﴿نفس﴾ لەزمانی عەرەبیدا مێیە و ﷲ دەفەرموێ: ئێوەم دروست کردوە لە یەك نەفسو های (مِنۡهَا)ش بۆ نەفسەکە دەگەڕێتەوە، واتە ئەوبۆ چونە هەڵەیە. بەڵێ بەرەی ئادەمیزاد هەمویان لەو بابو دایکەنو هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوانیان دا وەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: **{كُلُّكُمْ بَنُو آدَمَ وَ آدَمُ خُلِقَ مِنْ تُرَابٍ** /البزار، صحح الالبا / هەموتان لە ئادەمنو ئادەمیش لە خاك دروستکراوە} کەوابو هیچ جیاوازیەك لە بەینی مرۆڤەکان دا نیە مەگەر بە زیاتر لە خوا ترسان، وە با هیچ کەس خۆی هەڵنەکێشێت بە سەر کەسێکی تردا کە بڵێت من لە فلانە تیرەم وە ئەو لە فلانە تیرەیە دەی مادام خوای میهرەبانو دانا مرۆڤی لە یەك کەس دروستکردو پەروەردەی دەکاتو چاودێریەتی مافێکی ئێجگار گەورەی بە سەر ئەم مرۆڤەوە هەیە کە بەندایەتی بکاتو فەرمانەکانی جێ بە جێ بکات ئەم مافەیش لە بەر دوو شتە یەکەم: وەك وتمان: خودا هەمو مرۆڤی دروستکردوە. دووهەم: خودا هۆیە بۆ پەیدا بونی ئەم مرۆڤە لە یەك گیان وئەو گیانەش کە ئادەمە لە خوا خۆیەوەیەو سەرچاوەی پەیدا بونی مرۆڤ بەتەنها هەر خۆیەتی کەواتە پەرەستنو بەندایەتی بۆ کردنی شتێکی پێویستە، هەروەها مادام ئێمە هەمو نەوەی ئادەمو حەواین پێویستە هاوکارو یارمەتی دەرو مشور خۆری یەکتر بین وەك لە سورەتی حوجورات ئایەتی سیانزە دا دەفەرموێ: ﴿ئەی خەڵکینە بە بێگومان کەئێمە ئێوەمان لە پیاوێك وژنێك دروستکردوەو کردومانن بە گەل گەلو تیرە تیرە تا یەکتر بناسنو لە گەڵ یەکتردا چاکە بکەن بەبێشك بەرێزتان لەلای خوا ئەو کەسەتانە کە زیاتر لە خوا بترسێت بێگومان کە ﷲ زاناو بەئاگایە﴾ وە لە بارەی خزمایەتیو پەیوەندیەکانیەوە چەندین فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ هەیە یەکێك لەوانە ئەم فەرمودەیە: {**أَحَبُّ الأعمالَ إ َ ا ِ إ ِانٌ بِا ِ ثُمَ صِلَةُ الرَحِمِ ثُمَ الأمرُ بِا َعرُوفِ وَالَنهيِ عَنِ ا ُنكَرِ وَأبغَضُ الأعمالَ إ َ ا ِ الإشرَاكُ بِا ِ ثُمَ قَطِيعَةُ الرَحِمِ**/ا امع الصغ ، حسنه الالبا / خۆشەویست ترین کردار لەلای خوا باوەڕبوونە بەخوا پاشان پەیوەندی خزمایەتیە پاشان فرمان بەچاکە کردنو بەرگری لە خراپە کردنە، وە ناشیرین ترین کردار لەلای خوا هاوبەشی دانانە بۆ خواپاشان بچڕانی خزمایەتیە} لەراستی دا ئەم لە خوا ترسانو پاراستنی مافی خزمایەتیە کە لە سەرەتای سورەتەکەوە هاتوە مەبەستێکی سەرەکیو هەرە گرنگی ئەم سورەتەیەو دەتوانم بڵێم هەمو باسەکانی یەکێك لەم دوو بەشە یان هەردوو بەشەکەی تێدایە، جا پێشەکی پێویستە خۆمان بەم دوو سیفەتە

چەكدار بكەین‌و ئینجا بچینە ناو سورەتەكەوە كە ئایەتی دووهەمی دەفەرموێ:

(٢) بە هەتیوان ماڵەكانیان بدەنەوەو ماڵی ئەوان نەگۆڕنەوە بە ماڵی خراپ جا ئەو ماڵە كەل‌و پەل بێت یان حەیوان‌و باخ‌و كێڵگە بێت، وە ماڵی ئەوان بەماڵی خۆتانەوە مەخۆن بەبێگومان ئەوە گوناهێكی گەورەیە. بەم شێوەیە الله كە سەرپەرەشت‌و چاودێری مرۆڤە، پێشەكی مافی لاوازترین مرۆڤ باس دەكات كە هەتیوەو باوكی نیەو لەوانەیە كەمتەرخەمی تێدا بكرێت‌و ئەو مرۆڤە خۆی یان ئەو ماڵەی تێدا بچێت جا ئاوا فەرمانمان پێ دەدات كە ماڵی هەتیوان بدەینەوەو داگیری نەكەین‌و نەیشی گۆڕینەوە بە شتی خراپ، وە ئەو هەتیوانەی كە ئافرەت بوون‌و سەرپەرەشتەكانیان ماڵ‌و جوانی ئەوانی بە لاوە پەسەند بو نیكاحیان دەكردن بەڵام مارەییەكی دادپەروەرانەیان بۆ دانەدەنان لە بەر ئەوە الله بەرگری كردن لەو جۆرە نیكاحەو فەرموێ:

(٣) ئەگەر ئێوە دەترسن كە دادپەروەر نەبن لە ناو ئافرەتە هەتیوەكانداو مارەییەكی دادپەروەرانەیان بۆ دانەنێن، یان تەنها لە بەر ماڵ نیكاحیان بكەن‌و ئارەزۆتان لێیان نەبێت ئەو نیكاحە نەكەن‌و وازیان لێ بێنن با بە ئازادانە هاوسەر بۆ خۆیان هەڵبژێرن‌و ئێوەش ئەوەی كە پاكە لە ئافرەتان بێجگە لەو ئافرەتە هەتیوانە نیكاح بكەن بۆ خۆتان دووان‌و سیان‌و چوار واتە: لە ئیسلامدا ماوە دراوە هەتا چوار ژن بهێنن، بەڵام ئەگەر ترسان بە دادپەروەرانە رەفتار نەكەن تەنها یەك ژن بهێنن. دادپەروەریش بریتیە لە دادپەروەری خەوتن‌و خۆراك‌و جل‌و بەرگ‌و لەم شتانەدا ژنەكان دەبێ وەك یەك بن، بەڵام خۆشەویستی دڵ داوا نەكراوە چونكە هەر لەم سورەتەدا هاتوە كە "ئێوە ناتوانن دادپەروەری رێك وپێك لە ناو ژنەكانتان دا بكەن" واتە دادپەروەری ناو دڵ چونكە دەبینی یەكێكیان ئەخلاقی چاك‌و رووخۆشترە كابرا زیاتر خۆشی دەوێت‌و یەكێكیان توندترە لە گەل كابراو باش هەڵسوكەوتی لە گەڵدا ناكات خۆشی ناوێت، كەلەسەر ئەو خۆشەویستییەی ناو دڵ لێپرسینەوە ناكرێت مادام نەیەتە كردارەوە. یان سود وەرگرن لەوانەی كە بە موڵكی یەمین دەستتان كەوتوە واتە بە پارەی خۆتان دەستتان كەوتوە، زەمانی كۆن ئەو ئافرەتانە بوون كە دەكڕان‌و دەفرۆشران واتە ئەگەر ترسان بە دادپەروەرانە رەفتار نەكەن یا یەك ژنی ئازاد بهێنن یان كەنیزەیەك، ئەگەر زیاد لە یەكێكیش بن واجب نیە وەك ئافرەتی ئازاد خەوتن وجل‌و بەرگیان وەك یەك بۆ بكات ئەگەرچی سونەتە لێرەش كابرا هەر دادپەروەرانە رەفتار بكات، جا ئەم كڕین‌و فرۆشتنە ئێستا لەوڵاتی ئیسلامیدا نەماوەو خەڵك بە رواڵەت ئازادە، بەڵام بە داخەوە كوفر ئەمڕۆ هەموی كردوە بە بەندەو بە كەیفی خۆی كڕین‌وفرۆشتنی پێدەكات، بەڵام بەندایەتیەكی زۆر زیرەكانەو ژێر بە ژێری كە بە رواڵەت نەك بەندە نیە بەڵكو لافی ئازادی‌و دیموكراتی‌و مافی مرۆڤ‌و ئەم شتانە لێ دەدات، ئینجا خوا دەفەرموێ: ئەم شێوە باشترە بۆ ئێوە كە ئێوە توشی هەژاری نەبن بە بۆنەی زۆری خێزان‌و منداڵەوە كە ئەو زۆریەش ببێت بە هۆی ستەم‌و لادان لە دادپەروەری، لە ریوایەتدا هاتوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ پەنای بەخوا دەگرت لەچوارشت: لەو چوارانە، {مِنْ جَهْدِ الْبَلَاءِ /متفق علیه/ لە بەڵای سەخت پرسیار كرا بەڵای سەخت كامەیە؟ فەرموی: ئەوەیە كە مرۆڤ ماڵی كەم بێت ومناڵی زۆر بێت} لە عائیشەوە هاتوە كە:

{أَنَّ رَجُلًا كَانَتْ لَهُ يَتِيمَةٌ فَنَكَحَهَا وَكَانَ لَهَا عَذْقٌ وَكَانَ يُمْسِكُهَا عَلَيْهِ وَلَمْ يَكُنْ لَهَا مِنْ نَفْسِهِ شَيْءٌ فَنَزَلَتْ فِيهِ وَإِنْ خِفْتُمْ أَنْ لَا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى أَحْسِبُهُ قَالَ كَانَتْ شَرِيكَتَهُ فِي ذَلِكَ الْعَذْقِ وَفِي مَالِهِ./البخاري/

بەراستی پیاوێك ئافرەتێكی هەتیوی هەبو جا نیكاحی كرد چونكە دارخورمای هەبو ئەگینا هیچ ئارەزۆیەكی لەوئافرەتە دا نەبو جا ئەم ئایەتە لەوبارەیەوە دابەزی ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُوا فِي الْيَتَامَى ...الآية﴾ النساء: ٣ ترساندنی لەوهەڵس‌وكەوتە بێ رەحمانە. الله دەفەرموێ:

(٤) مارەیی بدەن بە ژنەكانتان كە بەخشێكەو پێویستە لە سەرتان ئەوسا ئەگەر ئافرەتان ئێوەیان عەفو كرد لەو مارەییە هەموی یان بەشێكی بە دڵی خۆیان نەك بە هەڕەشەو ترس یان بە خەڵەتاندن، بیخۆن عافیەتتان بێت. لەفەرمودەدا هاتوە كە ئەگەر كەسێك ئافرەتێك مارە بكات و قەسدی وابێت كە مارەیی یەكەی نەدات وەك زینا بكات وایە.

(٥) ئەو ماڵەی كە الله ئێوەی كردوە بە سەرپەرەشتی مەیدەنە دەستی مرۆڤی بێ عەقڵ ونەزان، وە رزقیان بدەنێ لەو ماڵەو جل‌و بەرگیان بۆ بكەن‌و بەقسەی جوان لە گەڵیاندا هەڵسوكەوت بكەن. ئەمە بۆ ئەوانەیە كە گێل‌و نازانن ماڵ خەرج بكەن‌و بێ سەرپەرشتن پێویستە ئەو ماڵەیان لە دەست دەربهێنن‌و بە گوێرەی پێویست خواردن‌و پۆشاكیان لەو ماڵە بۆ بكەن‌و ماوە نەدەن كە ئەو ماڵەیان بە هەدەر بڕوات مانای ئەوە نیە، كە تۆ ماڵەكەی لێ بسێنی بە شەق‌و بە تێهەڵدان چونكە مەبەستی سەرەكی ماڵ نیە بەڵكو مەبەست كابرایە، واتە: ئەو كەسە فێری رەوشتی جوان‌و ئیدارە كردنی باش بكە تا هێواش هێواش ئەویش هەستی دڵسۆزی‌و چۆن ژیان بكات‌و لە ئایندە دا ببێت بە مرۆڤێكی بە سود لە كۆمەڵگادا، ئا بەم شێوەیە ئیسلام چاودێری‌و مشور خۆری گەلەو هەموویان بە یەكەوە دەلكێنێت‌و لە خۆشی‌و

ناخۆشی یەکتر ئاگاداریان دەکاتەوەو هەریەك بەرامبەر بەوی تر بە بەرپرسیار دەزانێتو دەڵێت: {كُلُّكُمْ رَاعٍ وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ /متفق عليه/ هەموتان شوانن‌و هەموتان بەرپرسن لە ژێر دەستەکەی خۆتان}، بەڵێ پاش باسی هەتیو وا لێرەشدا باسی مرۆڤی هەڵە خەرج ونەزان دەکات، کە ئەگەر نەیزانی ماڵ خەرج بکات ئەوە بۆی نیە کەبڵێت ماڵی خۆمەو بەکەیفی خۆمە چۆنی خەرج دەکەم، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿أَمْوَالَكُمُ﴾ ماڵەکانتان، چونکە ئەو کابرای هەڵە خەرجە ئەگەر هەموماڵەکەی خۆی خەرج کرد لە دواییدا فەقیر دەکەوێتو دەبێت بەبار بە سەر کۆمەڵگاوە لە بەر ئەوە ئەوان مافیان هەیە بە سەریەوە لێرەوە دەردەکەوێت، کە ئەو ماڵ وسەروەتە هەموی موڵکی ئەو خەڵکە موسڵمانەیەو ئەمانەتە لە دەستی میری‌و دەسەڵاتداری وڵاتدا بە گشتی، جا ئەگەر بە شێوەیەکی دادپەروەرانە خەرجی نەکردو درایە دەستی کۆمەڵێك نەزان‌و بە کەیفی خۆیان خەرجیان دەکرد لە سەر موسڵمانان واجبە کە بە دەنگ بێن ونەهێڵن ئەو ماڵە بەو شێوەیە سەرف بکرێت. جێگای داخە بۆ دەبێ مرۆڤەکان ژیرو دانا نەبن‌و پەند لە رابردوی خۆیان وەرنەگرن هەر کام دێتە سەر کار ئەوی تر تاوانبار دەکات بە خراپە کاری بەتایبەت لەبارەی داراییەوەو کەچی خۆیشی بە هەمان رێی وشوێندا دەڕوات، جا ئەوەی کە دەستی لە ناو ماڵی موسڵمانان دایەو بە کەیفی خۆی خەرجی دەکات با بزانێت کەرۆژی دادگایی کردنی دێتو کورسی بۆکەس نامێنێت{نِعْمَتِ الْمُرْضِعَةُ وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ/ چەندجوانە شیردەرو چەند ناشیرینە شیر بڕەوە} واتە ریاسەتو لێ سەندنەوە. هەر لە سەرەتای ئەم سورەتەدا تێی گەیاندین کە هەمومان لە یەك بەرەبابین‌و کەس بە سەر کەسدا جیاوازی نیەو بە بۆنەی خزمایەتیەوە مافمان هەیە بە سەر یەکترەوەو لە پاشدا لە لاوازترین کەسی کۆمەڵەوە کە هەتیو بو سورەتەکەی دەست پێ کردو داوای لێ کردین کە ماڵیان نەخۆین‌و تەماع لە ماڵ‌و جوانی ئافرەتی هەتیو نەکەین‌و ماڵ بە دەستی هەڵە خەرج ونەزانەوە نەدەین وماڵی هەتیوانیش بپارێزین هەتا باڵغ دەبن وەك دەفەرموێ:

⑥ کاتێ ماڵتان وەرگرت لەو هەتیوانەی کە سەرپەرشتیان دەکەن تاقیان بکەنەوە هەتا دەگەنە حەدی بلوغ‌و نیکاح جا ئەگەر ئێوە دەرکتان کرد کە ئەوان پێگەیشتون‌وبەفامن و دەتوانن ماڵەکەیان بەجوانی سەرف بکەن جا ئالەو کاتەدا ماڵەکەیان پێ بدەنەوەو ماڵەکەیان بە زیادەڕەوی بە پەلە پەل نەخۆن بەر لەوەی کە گەورە ببن‌و هیچیان بۆ نەمێنێتەوە، جا کەسێك کە سەرپەرشتی ئەو ماڵە دەکات ئەگەر دەوڵەمەندە با خۆی لێ بگرێتەوەو لەو ماڵانە خەرج نەکات، وە ئەگەر کابرا فەقیرەو سەرپەرەشتی ئەو جۆرە ماڵانە دەکات با بە شێوەی عادەت بیخوات واتە چەندێك پێویستی هەیە با لەو ماڵە خەرج بکات. هەتیو بەو کەسە دەڵێن کە باوکی نەمابێت و باڵغ نەبوبێت جا باڵغ بوون لە کوڕاندا یان بە پەیدابونی شەهوەت دەبێت وەك لەم فەرمودەدا هاتوە کە دەفەرموێ: {لَا يُتْمَ بَعْدَ احْتِلَامٍ /ابو داود، صححه الالبا / دوای پەیدا بونی شەهوەت هەتیوی نیە} وە یان تەمەنی بگاتە پانزە ساڵ کە ئەمەش لە ریوایەتی بوخاری دا هاتوە کە عەبدوڵای کوری عومەر دەڵێت: بۆ جەنگی ئوحود خۆم پیشانی پێغەمبەرﷺ دا کە چواردە ساڵ بووم ماوەی نەدامو لە شەڕی خەندەق دا کە پانزە ساڵ بووم پیشانی درام ماوەی هاوکاری پێ دام کە بەشداری لە شەڕ بکەم عومەری کوری عبدالعزیز فەرموی: ئەمەیە نێوانی بچوك‌و گەورە، جا پێویستە موسڵمانان ماڵی ئەو مرۆڤە لاوازانە بە جوانی بپارێزن وتەماعی تێ نەکەن، بەڵام ئەگەر ئەوەی کە سەرپەرشتی دەکردن فەقیر بو جا ئەوە دایکی مناڵەکان بێت یان بێجگە لەو بێت دەتوانێت بە شێوەی باوی خەڵك بیخوات وەك لە پێشەوە وتمان ئەمە رێگای راست ودروستە بۆ سەرپەرەشتەکانی ئەو ماڵە جا ئەوەی کە ئەمڕۆ لە هەندێ ناوچەی کوردستان دا باوەو بانگی مەلا دەکەن لە پاش مەرگی خاوەن ماڵەکەو ماڵ دەفرسێنن‌و دەیدەن بە دایکی مناڵەکان گوایە ئیتر ئەو ماڵە حەڵاڵە ئەوە شتێکی ناڕاستەو هیچ بەڵگەیەکی شەرعی نییە یان لە هەندێ جێگای تردا سەر لە هەتیوان نادەن وئەگەر سەریشیان لێ بدەن شتێکی کەم وەك چای یان شتێکی تریان بۆ بهێنن نایخۆن ئەوەش شتێکی پەسەند نیەو بگرە تاوانیش بێت، چونکە مناڵەکان بەو نەخواردنە برینەکەیان تازە دەبێتەوەو باوکیان دەکەوێتەوە بیر، برام سەر لە هەتیوان بدە خێرت دەگاتێ جا ئەگەر هەتە شتێکیش لە گەل خۆتدا ببەو دڵخۆشیان بکە، وە ئەگەر دەسەڵاتیشت نەبو بەو سەر لێدانە ئەوان دڵیان خۆش دەبێتو ئەگەر شتێکی بچوکیان بۆ هێنایت بیخۆو دڵیان مەشکێنە تۆش چیت پێ کرا لە چاکە درێغی مەکە هەر هیچ نەبێت ئامۆژگاریان بکە گوێ لەو قسە پووچە مەگرە کە دەڵێن: (هەتیو لە سێبەری ماڵەکەیشیا دانیشیت گوناهت دەگات) لە مەو دوا هەر لەم سورەتەدا باسێکی تری ماڵی هەتیو دێت. جا ئەگەر کەسێك ناچار بو بە خواردنی ماڵی هەتیو لە پاشان دەوڵەمەند بو بیداتەوە یان نە، دوو بۆچون هەیە یەکێکیان ئەوەیە کە نەخێر پێویست ناکات بیداتەوە کە ئەمەشیان راستە لە لای زانایانی شافیعی مەزهەبدا، چونکە ئایەتەکە حەڵاڵی کردوە بۆ ناچارو باسی بژاردنەوەی نەکردوە بەڵێ ماڵی هەتیوان دەبێ بپارێزرێ تا باڵغ دەبن دیارە خەرجی

لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُو الْقُرْبَىٰ وَالْيَتَامَىٰ وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٨﴾ وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا ۖ وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا ﴿١٠﴾ يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَاءً فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ الثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ السُّدُسُ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِي بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۗ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ اللَّهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾

هەتیوەكانی لێ دەكرێت جا ئەگەر مایەوە كاتێ باڵغ بوون دەبێ بیاندرێتەوە، جا دەفەرموێ: كاتێك كە ماڵەكەتان پێدان دەی شایەت بگرن لە سەری نەوەك شەڕو نیزاع دروست بكرێت لە دواییداو بەسە كە ﷻ حیسابی لە گەڵ دا بكات. واتە بزانن ئەگەر تۆی شایەت بگر تەنها بۆ فرو فێڵ بێت لەو شایەتیەدا تۆ رزگار نابیت جا ئاگات لە خۆت بێت بزانە كە ﷻ لێپرسینەوەت لە گەڵدا دەكاتو زۆر بە وردی تەماشای ئیشەكانتان دەكاتو زەڕەی لا ون نابێت، ئینجا باسی مافی پیاوو ژن دەكات لەمیراتو دەفەرموێ:

﴿٧﴾ بۆ پیاوان بەشێك هەیەلەوەی كە دایك وباوكیانو خزمانیان بە میرات بە جێی دەهێڵن هەروەها بۆ ژنانیش هەیە بەشێك لەوەی كە لە دایك وباوكیانو خزمانیان بە جێ دەمێنێ لەو ماڵە كەم بێت یان زۆر بێت بەشدارن تێیدا، ئەمە بەشێكی فەرز كراوەو لەلایەن ﷻ و دانراوەو كەس بۆی نیە بیگۆڕێتو دەبێ بەو شێوەبێت كە لە پاشدا باس دەكرێت بۆمان، ئینجا ﷻ یاسایەكی تر سەبارەت بەو كەسانەی كە لە كاتی دابەشكردنی میرات دا ئامادە دەبن باس دەكات ودەفەرموێ:

﴿٨﴾ خۆ ئەگەر لەكاتی دابەشكردنی میراتدا خزمانی نزیكیو هەتیوانوكەم دەستان لەوێ بوونو میراتیان وە بەر نەدەكەوت ئەوە لەو ماڵە بەشی ئەوانیش بدەن، جا زۆرێك لە زانایان پێیان وایە كە ئەم ئایەتە مەنسوخە بە ئایەتی (**ارث**) وە بە گوێرەی ئوسوڵ بە مەنسوخ دانەنرێت چاكەو ئەگەر ئەوانە حازر بون شتێكیان پێ بدرێت ئەمە ریواتێكە لە عەبدوڵا ی كوڕی عەباسەوە. وە قسەیان لە گەڵدا بكەن بە قسەیەكی جوان، وە ئەگەر هەر نەگونجا هیچ بەوانە بدرێت با بە قسەیەكی جوان دڵی ئەو جۆرە خزمە فەقیرو هەتیوانەی تر بدرێتەوە چ بڵێین ئایەتەكە مەنسوخە یان ماڵەكە وا نیە شتێ بەوان بدرێت وەك باخو خانوو زەویو زار.

﴿٩﴾ با بترسن ئەو كەسانەی كە ئەگەر لە پاش خۆیان منداڵانێكی لاواز بە جێ بهێڵن كەبترسن لێیان كە چییان پێ بكرێتو چۆنیان لە گەڵدا بجوڵێنەوە با ئاوەهایش بجوڵێتەوە لە گەڵ ئەو هەتیوانەی كە لە ژێردەستی ئەواندایە جابا لە خوا بترسنو با قسەی جوانیان لە گەڵدا بكەن وە دڵیان نەشكێنن لە فەرمودەیەكدا كە مسلم بۆمان دەگێڕێتەوە هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ عَالَ جَارِيَتَيْنِ دَخَلْتُ أَنَا وَهُوَ الجَنَّةَ كَهَاتَيْنِ وَأَشَارَ بِأُصْبُعَيْهِ** /**رواه الترمذي**/ هەر كەسێك دوو كچ ـ هی خۆی یان هەتیوبن ـ بە خێو بكات تا باڵغ دەبن لە رۆژی قیامەتدا من وئەو ئاوەهادەچینە بەهەشتەوە هیمای كرد بەدوو پەنجەی} بەشێوەیەكی تر : بابترسن ئەوكەسانەی كەمناڵانی وردیان لەپاش بەجێ دەمێنێ لەوەسیەتكردندا زیانیان پێ نەگەیەننو با قسەی جوانیان بۆ بكەن و.....هتد ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٠﴾ بەراستی ئەوانەی كە ماڵی هەتیوان دەخۆن بەناڕەوا ئەوانە هەر ئاگر دەخەنە ناو سكی خۆیانەوەو بەم زوانە دەخرێنە ناو ئاگرێكی بڵێسەداریشەوە واتە لە دنیادا بەخواردنی ئەوماڵەئاگر دەخەنە ناو سكی خۆیانەوە، جا دەگونجێت هەر ئاوەها بێتو خوا بیكات بە موسیبەتێك بۆ ئەو كابرایە تا هەمو سەروەتو سامانی لە بەین دەباتو دەیسوتێنێت لە دنیادا، جا كە باسی هەتیوی بۆ كردین، دیارە كەسێك دەمرێت بۆیە هەتیو دەبێت جا ئەگەر ماڵو شتێكی لێ بە جێ ما چۆن دابەش دەكرێت؟ ﷻ دەفەرموێ:

﴿١١﴾ ئا بەم شێوەیە وەسیەتتان بۆ دەكات لە بارەی منداڵەكانتانەوە ئەگەر هاتو كەسێك مردو منداڵی لێ بە جێما نێرو مێو تێكەڵاو بۆهەر كوڕێك بەوێنەی دووخوشك بەشیەتی، لێرەدا ئەوانەی كە باوەڕیان بە خواو حاكمیەتی خوا نیە دەم دەكەنەوەو خۆیان بە مشور خۆرو خەمخۆری ئافرەتان پێشان دەدەنو رەخنە لە ئایین دەگرنو دەڵێن ئایین مافی تەواوی بە ئافرەت نەداوەو ئافرەتی بە كەم تەماشا كردوە بەڕاستی ئەمە وەك وتمان: بەڵگەی بێباوەڕیو نەزانیە، یان بۆ هەڵخەڵەتاندنی ئافرەتە ئەگینا دەتوانم بڵێم لێرەدا ئافرەتان زیاتریان لە پیاوان بەر دەكەوێت، چونكە ئافرەت وەك ئەو بەشەی خۆی دەبات كە

نیوەی براکەیە خەرجی هەر لە سەر برای گەورەیە تا شو دەکاتو ئینجا خەرجی لە سەر مێردەکەیەتیو ئەگەر بە ئەندازەی چیایەك ماڵی خۆی هەبێت دەتوانێ هیچی لێ خەرج نەکات، بەڵام براکەی خەرجی خوشکەکەی تا شو دەکاتو خەرجی خۆیو خەرجی ژن هێنانی لە سەرە دەی ئایا ئەمەی کە بردویەتی لە چاو خوشکەکەیدا زۆرە یان کەم ؟ لەو بارەوە ئەو ئافرەتانە مافی کەسیان لەسەرنییە بەڵام لە بەر ئەوەی کە کابرای مردو هی هەردووکیانەو هەردوو دڵیان بریندار بوە نیوەی براکەی پێ دەدرێت، جا ئەگەر هەر ئافرەت بوونو زیاتر لە دووان بوون ـ ئەگەر دوانیش بوون ـ وەك لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە ئەوسا دوو بەش لە سێ بەشی تەواوی ئەو ماڵە بۆئەوانە واتە ئەگەر کابرا بمرێت دوو کچ یان دوو خوشك یان زیاتر لەوانەی هەبێت دەبێ ئەو ماڵە دابەش بکەن بە سێ بەشو دوو بەشی ئەو ماڵە بەوان بدرێت، وە بەشێك دەمێنێتەوەو ئەگەر یەك کچی بو، یان یەك خوشکی بو ئەوسا نیوەی ماڵەکە بۆ ئەو دەبێتو نیوەکەی تری دەمێنێتەوە جا ئەگەر ماڵی گشتی (بیت ا ال) رێك وپێك نەبو دابەشی دەکەن بە سەر ئەو کەسانەی کە خاوەنی فەرزو واجبەکانن ـ جگە لەپیاوژن بە گوێرەی دابەش کردنی خۆیان لە پێشەوە، پیاوو ژن هەر فەزە دیارییەکەی خۆیان پێ دەدرێتو بۆ باوكو دایکی مردوەکە، لەوەی کە بەجێماوە لە پاش مردوەکە ئەگەر ئەو مردوە منالّ ، کوڕ یان کچی بو شەش یەك دەبەن خۆئەگەر مردوو منالّی نەبو یان منالّی کوڕی نەبو لەم کاتەدا دایك سێ یەکی ماڵەکە دەبات، جائەگەر چەند برا یان خوشکێکی بوو ئەو کاتە دایکی دووبارە شەش یەك وەردەگرێت واتە دایکی سێ یەکی ماڵەکە دەبات کاتێ مردوو نە منالّی ببێت وە نە منالّی کوڕی ببێت وە نە ژمارەیەك لە خوشك برای هەبن وە ئەگەر یەکێك لەوانە بو دایك شەش یەکی ماڵەکە دەبات ئەمەش لە پاش ئەنجامدانی وەسیەتێك کە ئەو مردوە دەیکات یان دانەوەی قەرزەکانی. ئەوە بەو مانا نیە کە قەرزەکە لە دواییدا بدرێتەوە بەڵکو پێشەکی قەرز دەدرێتەوە ئینجا وەسیەتەکەی جێ بەجێ دەکرێت بە مەرجێك لە سێیەکی ماڵەکە تێ نەپەڕێتو پاشان بە سەر میرات گراندا دابەش دەکرێت بەو شێوەیە کە باسکرا، ئینجا دەفەرموێ: باوکانتانو کوڕەکانتان ئێوە نازانن کامیان سودیان زۆرترە بۆتان، کەواتە نە باوك بێ بەش دەبێتو نە ئەولاد بێ بەش دەبێت واتە هەرگیز دایك وباوك بێ بەش نابن لە ماڵی ئەولادیان وە ئەلادیش بێ بەش نابێت لە ماڵی دایك وباوك ئەگەرشتێك نە بێ بە هۆی بەرگری. هەندێ کەس دەڵێت فلانە کوڕم بێبەری کردوە ئەوە بە هیچ شێوەیەك بێبەری نابێتو قسەیەکی هەڵەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: ئێوە نازانن کامیان سودیان زیاتر دەبێتو ئەو بەشەش دیاری کراوە لە لایەنی خوا وەو کەس بۆی نیە دەستکاری بکات، بە بێگومان کە ﷲ زانەرەو دانایەو ئیشی بێسودی نیە، کەواتە کەس مافی دەست کاری نیە.

ئەم ئایەتەو ئایەتی پاش ئەمو ئایەتی ئاخیری ئەم سورەتە کە سێ ئایەتن لەسەر چۆنیەتی دابەشکردنی میرات دەدوێن، هەر چەند فەرمودەی پێغەمبەرﷺ لەم بارەوە هاتوە هەموی بەیانی ئەم سێ ئایەتەنو ئەم عیلمە عیلمێکی زۆرگرنگەو وتراوە یەکەم عیلمە کە لە بیر دەچێتەوە. جابیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: نەخۆشبوم پێغەمبەری خواﷺ کە ئەبو بەکری لە گەڵدا بو هاتە سەر خۆشیم بە پیادە لە ناو خێڵی (بەنی سەلەمە)دا پێغەمبەری دی کە من هۆشم بە خۆم نیە، داوای کرد هەندێ ئاویان بۆ هێناو دەست نوێژی لێ گرت لە پاشان هەندێ ئاوی لێ پرژاندم دەس‌و دەم هاتمەوە هۆش وتم چ پرپیارێکت هەیە ئەی پێغەبەری خواﷺ لە بارەی ماڵەکەمەوە؟ جا ئەم ئایەتەدابەزی ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾ متفق علیه} ئەمەی کە باسکرا سەبارەت بە دابەزینی ئەم ئایەتە لەوە دەچێت ئەم پرسیارە وەڵامی هۆی دابەزینی ئاخر ئایەتی ئەم سورەتە بێت، چونکە لە وکاتەدا جابیر خوشکی بوەو (کەلالەی) پێ دەوترێت ئەم فەرمودەیەی تر دیسان کە لە جابیرەوە هاتوە نزیکترە کە خێزانی کوڕی سەعدی رەبیع هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺئەمە دوو کچەکەی سەعدە کە باوکیان لە گەڵ تۆ دا لە ئوحود دا شەهید بو بەراستی مامەکەیان ماڵەکەی بردونو هیچی بۆ ئەمان نەهێشتوەتەوە، ئەگەر ماڵیشیان نەبێت کەس نایانخوازێت جابیر دەڵێت: پێغەمبەرﷺ فەرموی خوا لەم بارەوە فەرمان دەردەکات، جابیر دەڵێت هەر بە دوای ئەوەدا ئایەتی کەلەپور(ا ات) دابەزیو پێغەمبەری خواﷺ ناردی بە شوێن مامەکەیان داو فەرموی: {أَعْطِ ٱبْنَتَيْ سَعْدٍ الثُلُثَيْنِ وَأَعْطِ أُمَّهُمَا الثُمُنَ وَمَا بَقِيَ فَهُوَ لَكَ/رواه الترمذی /بە دوو کچەکەی سەعد دوسێیەکی ماڵەکەیان پێ بدەو هەشت یەکی ماڵەکە بدە بە دایکەکەیانو ئەوەی کە ئەمێنێتەوە بۆ خۆت} لێرەوە دەرکەوت کە دوو کچیش هەر دوو بەش لە سێ بەشی تەواوی ماڵەکە ئەبەن.

ئەوەش بزانە کە دایك بە سێ شێوە میرات دەبات کە دووانیانمان لە پێشەوە باس کردوە سێهەمیان ئەوەیە کە دایك پاش مافی مێرد یان ژن یەك بەش لە سێ بەشی باقی دەبات وە ئەوەی کە دەمێنێتەوە باوك دەیبات ئەویش تەنها لەم دوو جێگادا دەبێت: یەکەم: کابرایەك بمرێت دایك وباوكو ژنی هەبێت، کەژنەکە چواریەکی تەواوی ماڵەکە دەباتو دایکەکە سێ یەکی باقی

﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّن بَعْدِ وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَا أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَالَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوا أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَاءُ فِي الثُّلُثِ ۚ مِن بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَا أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَارٍّ ۚ وَصِيَّةً مِّنَ اللَّهِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ (١٢) تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ (١٣) وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا خَالِدًا فِيهَا وَلَهُ عَذَابٌ مُّهِينٌ (١٤)﴾

ماڵەکەوئەوی تر هی باوکە **دووهەم**: ژنێك بمرێت دایك وباوكو مێردی هەبێت. مێردەکە نیوەی ماڵە کەی دەبات پاشان لەنیوەکەی تری دایکی سێیەك دەباتو باقی هی باوکێتی، درێژەی ئەم باسانە لە پەڕاوە فیقهەکاندا تەماشا بکە، ئینجا دەچینە سەر ئایەتی دووهەمی میرات کە دەفەرموێ:

(١٢) نیوەی میراتێ کە لە خێزانەکانتان بە جێ دەمێنێ بۆ ئێوەیە ئەگەر ئەو ژنانە منداڵ، یان منداڵی کوڕیان نەبێت چ لەو مێردە یان لە مێردێکی تری، وە ئەگەر منداڵ یان منداڵی کوڕیان بو ئەو کاتە ئێوەی مێرد چواریەك دەبەن لەوەی کەلە ژنەکانتان بە جێ ماوە پاش ئەنجامدانی وەسیەتێك کە کردویانەو دانەوەی قەرزێك کە لە لایان بێت، کەواتە دانەوەی قەرزەکە لەپێش دابەش کردنە، ئینجا بزانن بە پێچەوانەوە ئەگەر مێردەکە بمرێتو ژنەکە بمێنێتەوە، ئەوان چوار یەکیان هەیە لەوەی کە ئێوەی مێرد بە جێی دەهێڵن لە ماڵو سامان ئەگەر ئێوەش منداڵ یان منداڵی کوڕتان نەبو بەڵام ئەگەر منداڵ یان منالی کوڕتان هەبو ئەوسا ژنەکان هەشت یەکیان هەیە. زیادەیە کەدەمێنێتەوە ئەگەر کەسی نەبو بە ماڵی گشتی **(بیت ا ال)** دەدرێت.

پێویستە ئەوە بزانین ئەگەر ژنەکان دوو یان سێ یان چوار بوون هەر هەشت یەکیان هەیە ئەگەر کابرا منالی هەبو، وەئەگەر منالیشی نەبو بە هەمویان چواریەك دەبەن ئەمەش دوای جێ بە جێ کردنی وەسیەتەکەتانو دانەوەی قەرزەکانتانە. وە ئەگەر پیاوێك ئیرسی لێ دەبەرا بە شێوەی "کەلالەی"یان ژنێك بە شێوەی کەلالەی ئیرسی لێ دەبرا.

**(کلالە)** واتە ئەو کەسەیە کە نە ئەسڵی هەبێت و نە فەرع، واتە نە دایك وباوکی هەبێتو نە منداڵیشی هەبێتو بمرێت جا برا یان خوشکێکی دایکی هەبێت ئەوسا بۆهەمو یەکێك لەوانە شەش یەکی ماڵەکەی پێ دەدرێت چ خوشك بێت چ برا ئەوسا ئەگەر زیاتر لەیەك بون لەوانە جا ئەو کاتە شەریکن لە سێ یەك دا چ هەمویان پیاو بن چ هەمویان ژن بن چ تێکەڵاو بن بە بێ جیاوازی لە نێوان نێرومێدا لێیان بەش دەکرێت لە دوای وەسیەتێك کە کردویانە یان دانەوەی قەرزێك کە لە سەریانە بەو مەرجەی وەسیەتەکەی زیانگەیەنەر نەبێتو بۆ شتی قەدەغە نەبێت، چونکە ئەگەر وەسیەتەکە زیانی بو هەڵدەوەشێتەوەو جێبەجێ ناکرێت، وە ئەمەی کە باسکرا وەسیەتێکە لە لایەنی خواوە بۆ مرۆڤو بۆ خاوەن باوەڕان کە ئیشی پێ بکەن، وە بەڕاستی الله زانەرو بەحەوسەڵەیە. پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {إن الله قد أعطى لكل ذي حق حقه فلا وصية لوارث / ابو داود، ابن ماجة، صححه الالبا / خوا بە هەمو خاوەن مافێك مافی خۆی پێداوە کە وابو نا بێ وەسیەت بکرێت بۆ کەسێك کە خۆی میرات گر بێت}چونکە مافی خۆی پێدراوە.

(١٣) ئەوەی کە باسکران سنورگەلێکن کە الله دایناونو هەرکەسێك بەشێکی هەبو دەبێ بەو شێوەیە پێی بدرێتو هەر کەسێك ئیتاعەی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ بکات، خوا دەیخاتە ناو بەهەشتانێکەوە کە لە ژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگە دەڕوات کەبۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو بەڕاستی ئەوەیە بەهرەو دەستکەوتی گەورە. جاسەبارەت بە سەرپێچی کەرانیش دەفەرموێ:

(١٤) ئەوسا هەر کەسێك نا فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات و سنورەکانی خوا ببەزێنێت الله دەیخاتە ناو ئاگرێکی گەورەوە کەبۆ هەمیشە تێیدا دەمێنێتەوەو بۆ ئەو هەیە سزایەکی وا کە گاڵتەی پێ دەکات.

ئەوەتە دۆزەخیان بەهێزی ئاگر بەرز دەکرینەوە تا نزیکی دەرگای جەهەننەم دەبنەوە دیسان فریشتەکان بە گورزی ئاگرین لێیان دەدەنو سەرەو خواریان دەکەنەوە بە ناو ئاگردا ئا بەو شێوەیە یاریان پێ دەکرێ. ئینجا الله حوکمێکی ترمان بۆ باس دەکات ودەفەرموێ:

(١٥) ئەو ئافرەتانەی کە داوێن پیسی بکەن لە ژنانتان داوای چوار شایەت بکەن لە خۆتان، واتە ئەو بڕیارە سەبارەت بە ئافرەتی موسڵمانە، جا ئێمە ئەگەر حوکممان لە دەست دابو کافر لە وڵاتماندا ژیا بەو مەرجانەی کە بۆی دانراوەو شتی خراپی وای کرد لە ناو خۆیاندا تا خۆیان نەیەنە دادگا ئێمە لێیان ناپرسینەوە بەڵام ئەگەر هاتنە لامان دە بێ حوکمیان بۆ بکەین بەو شێوەی کە حوکم دەکەین بە سەر ئافرەتی موسڵمان دا، ئینجا دەفەرموێ: ئەگەر شتێکی وایان کرد واتە ئەگەر بە چوار شایەت نەبێت ئەو تاوانە سابت نابێت، چونکە ئەوە ئیشێکی خراپەو نا بێ بە گومان ئەو نیسبەتەی لێ بدرێت، جا ئەگەر بەم شێوەیە سابت نەبو هەر کەسێك باسی بکات دەبێ حەدی لێ بدرێت کە هەشتا دارە جا ئەگەر هاتو چوار نەفەر شایەتیان لە سەر دا ئەو کاتە زیندانیان بکەن لە ماڵەکەی خۆیاندا هەتا دەمرن یان تاﷲ دەرگایەکیان لێ دەکاتەوە ئەمە بەر لەوە بوە کە ئایەتی دیاری کردنی حەدی زینا دابەزێت کاتێ سورەتی (النور) دابەزی پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: {خُذُوا عَني خُذُوا عَني قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَهن سَبِيلًا الْبِكْرُ بِالْبِكْرِ جَلْدُ مِائَةٍ وَنَفْيُ سَنَةٍ وَالثيبُ بِالثيبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَالرجْمُ /مسلم وغ ة/ فەرموی: لێم وەرگرن، لێم وەرگرن خوا دەرگای لێ کردنەوە ئەوەی کەنیکاحی حەڵاڵی نەدیبێت سەد داری لێ دەدرێتو ساڵێکیش دوور دەخرێتەوە، وە ئەوەش کە دی بیبێتی سەد داری لێ دەدرێتو بەردباران دەکرێت}. ئینجا باسی ئەو پیاوانە دەکات کە کرداری قەومی لوت دەکەنو دەفەرموێ:

(١٦) ئەوانەی کە شتی ئاوایان کرد ئازاریان بدەنو قسەیان پێ بڵێنو سەرزنشتیان بکەن جا ئەگەر تەوبەیان کردو ئیشی باشیان کرد ئەوسا ئیتر وازیان لێ بهێننو گوێیان نەدەنێو باسیان نەکەن، بە بێگومان کەﷲ تەوبە وەرگرەو بە رەحمە. وەك وتمان ئەم یاسایە بەر لە دابەزینی یاسای زینا بووەو بەو یاسایە ئەم حوکمە هەڵوەشاوەتەوە، زینا کار پیاو بێت یان ئافرەت بەو شێوەیە کە لەو فەرمودەی پێشوەدا باسمان کرد، وەبۆ ئەوانەش کە ئیشی قەومی لوت ئەنجام دەدەن پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {مَنْ وَجَدْتُمُوهُ يَعْمَلُ عَمَلَ قَوْمِ لُوطٍ فَاقْتُلُوا الْفَاعِلَ وَالْمَفْعُولَ بِهِ/رواه اصحاب السنن وصححه الالبا / هەرکەسێکتان دی کە کرداری وەك کرداری گەلی لوت بکات ئەوسا هەردووکیان بکوژن}ئینجا لەبارەی تەوبەوە دەفەرموێ:

(١٧) تەوبە لە لایەنی خوا وە هەر بۆ ئەو کەسانەیە کە ئیشی خراپە دەکەن بە نەزانین، لە پاشان بەزووی تەوبە دەکەن جا ئەمانە ﷲ تەوبەیان لێ قەبوڵ دەکات، وە ﷲ زانەری تەواوی نیەتو وتارو کردارو ئیشەکانەو بە حیکمەتە. قەتادە دەڵێ: {أن

وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ فَٱسۡتَشۡهِدُواْ عَلَيۡهِنَّ أَرۡبَعَةٗ مِّنكُمۡۖ فَإِن شَهِدُواْ فَأَمۡسِكُوهُنَّ فِي ٱلۡبُيُوتِ حَتَّىٰ يَتَوَفَّىٰهُنَّ ٱلۡمَوۡتُ أَوۡ يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لَهُنَّ سَبِيلٗا ﴿١٥﴾ وَٱلَّذَانِ يَأۡتِيَٰنِهَا مِنكُمۡ فَـَٔاذُوهُمَاۖ فَإِن تَابَا وَأَصۡلَحَا فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ تَوَّابٗا رَّحِيمًا ﴿١٦﴾ إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧﴾ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَحِلُّ لَكُمۡ أَن تَرِثُواْ ٱلنِّسَآءَ كَرۡهٗاۖ وَلَا تَعۡضُلُوهُنَّ لِتَذۡهَبُواْ بِبَعۡضِ مَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَعَاشِرُوهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِۚ فَإِن كَرِهۡتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰٓ أَن تَكۡرَهُواْ شَيۡـٔٗا وَيَجۡعَلَ ٱللَّهُ فِيهِ خَيۡرٗا كَثِيرٗا ﴿١٩﴾

أَصْحَابَ رَسُولِ اللهِ ﷺ كَانُوا يَقُولُونَ: كُل ذَنبٍ أَصَابَهُ عَبْدٌ فهو جهالة عَمْدًا كَانَ أَوْ غَيْرَه /رَوَاهُ ابْنُ جَرير/ هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ دەیان وت هەمو تاوانێك کە بەندە دەیکات ئەوە نەزانیو نەفامیە چ بە عەمد بێت یان بەبێ عەمد.)

(١٨) تەوبە نیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیشی خراپەدەکەن هەتا مەرگ یەخەیان دەگرێت. زۆربەی زانایان دەڵێن کە گیان دەگاتە نزیك قوڕگ لەو حاڵەتەدا تەوبە قەبوڵ نیە، چونکە کابرا شوێنو وەزعی خۆی دەبینێت. لە ریوایەتا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إِن اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ/ ا د وابن ماجه وصححه الالبا / بێگومان کە ﷲ تەوبەی بەندەی خۆی وەردەگرێت مادام لە سەرەمەرگو گیانداندا نە بێت} کە ئەم ئایەتەش دەفەرموێ: تەوبە نیە بۆ ئەو کەسانەی کە ئیشی خراپ دەکەن تا مردن یەخەیان دەگرێت، ئینجا لەو کاتەدا دەڵێت: بەراستی من ئێستە تەوبە دەکەم؟! جا زۆر کەس هەیە دەڵێ ئێستا کاتی تەوبە نیە کاتێ کە پیر بوم تەوبە دەکەم وەك ئەوەی کەمردن بەدەست خۆی بێت ئەی قوڕ بەسەریان لە کوێ دەزانن کەی دەمرن، بەڵکو لە ناکاو مردن ئەو کاتە چی دەکەن؟ ئینجا دەفەرموێ: وە تەوبە قەبوڵ نیە بۆ ئەو کەسانەی کە بە کافری دەمرن، واتە ئەوانەی کە بە کافری دەمرن هەرچەندە پەشیمان ببنەوەو تەوبە بکەن لە قیامەتدا تەوبەیان لێ قەبوڵ ناکرێت. یان کابرا موسڵمان بووەو لە دوایدا پاشگەز بوەتەوەو بە کافری مردوە تەوبە کردنی پێشوی

وَإِنْ أَرَدتُّمُ ٱسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَءَاتَيْتُمْ إِحْدَىٰهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا۟ مِنْهُ شَيْـًٔا ۚ أَتَأْخُذُونَهُۥ بُهْتَـٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿٢٠﴾ وَكَيْفَ تَأْخُذُونَهُۥ وَقَدْ أَفْضَىٰ بَعْضُكُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ فَـٰحِشَةً وَمَقْتًا وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٢٢﴾ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ وَأَخَوَٰتُكُمْ وَعَمَّـٰتُكُمْ وَخَـٰلَـٰتُكُمْ وَبَنَاتُ ٱلْأَخِ وَبَنَاتُ ٱلْأُخْتِ وَأُمَّهَـٰتُكُمُ ٱلَّـٰتِىٓ أَرْضَعْنَكُمْ وَأَخَوَٰتُكُم مِّنَ ٱلرَّضَـٰعَةِ وَأُمَّهَـٰتُ نِسَآئِكُمْ وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ ٱلَّـٰتِى دَخَلْتُم بِهِنَّ فَإِن لَّمْ تَكُونُوا۟ دَخَلْتُم بِهِنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ وَحَلَـٰٓئِلُ أَبْنَآئِكُمُ ٱلَّذِينَ مِنْ أَصْلَـٰبِكُمْ وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٢٣﴾

سودی پێ نادات كە بڵێت: من كاتی خۆی موسڵمان بوومو تەوبەم كردوە، بۆ ئەوان ئامادەمان كردوە سزایەكی دەردناك. لە فەرمودەیەكی تری پێغەمبەرماناﷺ هاتوە كە ئەمەو فەرمودەی پێشویش ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدا هێناویەتی كە دەفەرموێ: {إن اللهَ يَقبلُ توبةَ عَبدِهِ أو يَغفِرُ لِعَبْدِهِ ما لَمْ يَقَعْ الحِجَابُ قالوا يَا رَسُولَ اللهِ وَمَا الحِجَابُ قالَ أَنْ تَموتَ النفسُ وَهِيَ مُشْرِكَةٌ/ أ د،ا سندرك،صححه الذهـ / بەراستی خوا تەوبەی بەندەی خۆی وەردەگرێت یان لە بەندەی خۆی خۆش دەبێت مادام پەردە پەیدا نەبێت. وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ پەردە چیە؟ فەرموی: مادام ئەو گیانە بە موشریكی دەرنەچوبێت}. ئینجا حوكمێكی ترمان بۆ باس دەكاتو دەفەرموێ:

﴿١٩﴾ ئەی ئیمانداران حەڵاڵ نیە بۆتان كە ژنان بە ئیرس ببەن بەزۆرەملی. لە پێشدا وابو ئەگەر ژنێك مێردەكەی بمردایە جا كام خزمی مێردەكەی لێی نزیك بوایە بە پەلە رای دەكردو پەلاسێكی دەدا بە سەر ژنەكەداو دەبو بە مافیو ئیتر بە كەیفی خۆی بو نیكاحی بكات بۆ ماڵەكەی یان نیكاحی نەكاتو نەی دا بە شویش تا دەمرد بۆ ئەوەی هەرچی ماڵی هەیە بۆ ئەو بێت ﷲ ئەوەی هەڵوەشاندەوە. وە رێگای مێرد كردنیشیان لێ نەگرن ئەگەر ویستیان مێرد بكەن بۆ ئەوەی كە هەندێك شتیان لێ بستێنن كە پێتان داون مەگەر داوێن پیسی بكەن چونكە بەو داوێن پیسیە زیانیان گەیاندوەبە حورمەتورێزی ئەو بنەماڵەیە بۆیە بۆیان هەیە كە تۆڵەیان لێ وەربگرنەوە وبڵێن: چەندێ زیانمان كردوە ئەوەندەمان دەوێت ئینجا وازیان لێ دەهێنین، وە بە باشی لە گەڵیاندا بجوڵێنەوە بە شێوەیەكی عورفو عادەت ئەوسا ئەگەر ئێوەرقتان لەو ژنانە هەیەو خۆشتان ناوون نزیكە ﷲ خێرێكی زۆری تێدا دانابن وەك ئەوەی كە كابرا ئافرەتێك كە خێزانیەتی خۆشی ناوێت كەچی ﷲ چەند ئەولادێكی باشو ساڵحی پێ دەداتو دەبن بە مایەی خێر بۆ دایك وباوكیان لە بەر ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {لَا يَفْرَكْ مُؤْمِنٌ مُؤْمِنَةً إِنْ كَرِهَ مِنْهَا خُلُقًا رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ /مسلم/ با هیچ پیاوێكی ئیماندار رقی نەبێت لە هیچ ئافرەتێكی ئیماندار، چونكە ئەگەر بێزارە لەرەوشتێكی ناشیرینی رەوشتێكی جوانیشی تێیدایە كە پەسەندی بێت}

﴿٢٠﴾ ئەگەر ویستتان ژنێك تەلاق بدەنو ژنێكی تر بخوازن و كۆمەڵە پارەیەكتان دابێت بەو ژنەی پێشوو كە ئێستا دەتانەوێ تەڵاقی بدەنو لێی جیاببنەوە ئەوسا هیچی لێ وەرنەگرنەوە، ئایا دەتانەوێ دوچاری سەرگەردانی بكەنو تاوانێكی ئاشكراش بكەن بەو وەرگرتنەوەیە؟ چونكە ئەو پارەیە مافی ئەو ئافرەتەیەو بە گواستنەوەی بووە بە موڵكی جا بەتەڵاق دانی بەڵێنی هاوسەریتان نەبردە سەرو دەتانەوێت ماڵەكەیشی بخۆن؟! ئابەوشێوەیە خوا داكۆكی لەسەر مافی ئافرەت دەكات.

﴿٢١﴾ دەی چۆن ئێوە ئەو ماڵەی لێ وەردەگرنەوە خۆ ئێوە بە شێوەی نهێنی لەیەكتر نزیك بونەتەوەو لە ئێوە پەیمانێكی گەورەیان وەرگرتوە كە هاوسەریان بن. ئابەم شێوەیەﷲ سۆزی ئەو مرۆڤە دەجوڵێنێ تا دەست لەو سەركەشیو لەجبازیەی خۆی بكێشێتەوەو بە شێوەیەكی جوان لە گەڵ ئەو ئافرەتەدا رەفتار بكات، چونكە ئەوانە بە بۆنەی كەلیمەی خواوە حەڵاڵ بوون بۆتان بۆچی ئێستە بەو شێوەیەی كە خوا دەفەرموێ: رەفتاریان لە گەڵدا ناكەن؟ ئینجا خوا باسی ئەو ئافرەتانەمان بۆ دەكات كە نیكاحیان دروست نیە كە ئەمانەش چوار بەشن، یەكەم: ئەوانەی كە بە نەسب حەرام دەبن. دووهەم: ئەوانەی كە بە هۆی شیرەوە حەرام دەبن. سێهەم: ئەوانەی كە بە هۆی ژن خوازییەوە(مصاهرە)وە حەرام دەبن. چوارەم: ئەوانەی كە نیكاح كراوی كەسێكی ترن. پێشەكی باسی نیكاحی سەردەمی نەفامیمان بۆ دەكاتو هەڵیدەوەشێنێتەوەو دەفەرموێ:

﴿٢٢﴾ ئەوئافرەتانەی كە باوكانتان نیكاحی كردوە نیكاحیان نەكەن مەگەر كەسێك كە لە پێش زانینی ئەم بریارەدا ئەو نیكاحەی كردبێت بە بێگومان ئەوەهەم زینایە هەم جێگای رقو قینی خوایەو پیسترین رێگای ژنو ژن خوازیە. كە ئەمە رێز دانانی خوایە بۆ باوكان تەنانەت هەر بە نیكاح كردنی حەرام

دەبێت لە سەر کوڕانی کابراو ئەمە قسەی هەمو زانایانە. ئینجا دەچێتە سەر باس کردنی ئەو چوار تاقمەی کە نیکاحیان دروست نیەو دەفەرموێ:

(٢٣) حەرام کراوە لە سەر ئێوە دایکانتانو کچانتانو خوشکانتانو پورە باوکییەکانتانو خوشکانی دایکانتانو کچانی براکانتانو کچانی خوشکانتانو ئەو ئافرەتانەی کەشیریان بە ئێوە داوەو خوشکانی شیریتان. ئەو کەسەی کە شیری ئافرەتێکی خوارد ئەو ئافرەتە ئەبێت بە دایکی جائەو ئافرەتە هەرچی منالی ببێت، دەبێت بەبراو خوشکی ئەو کەسە، وەدایکی ژنانتان (خەسو) هەر بە نیکاح کردنی کچەکەی نیکاحی دایکەکەی بۆ هەمیشە حەرام دەبێت، وە حەرام دەبێت لێتان کۆڵەوەسەکانتان (کچی ژن لە مێردێکی تری) کە لاتان بن بەو مەرجەی چوبنە لای دایکیان بەڵام ئەگەر هەر نیکاحی دایکیان کردنو نەیانگواستنەوەو تەڵاقیان دان دەتوانن کچەکانیان نیکاح بکەن ئیتر ئەوە مەرج نیە کە ئەو کچانە لای خۆتان بن یان نە. بە چونە لای دایکەکەیان نیکاحیان حەرام دەبێت بۆ هەمیشە ئەمە بەشی سێهەمی بوو کە بەشی دووهەمی دایك وخوشکی شیربوو باس کران، پێویستە ئەوە بزانین کە هەرچی بە نەسەب حەرام دەبێت بە شیریش حەرام دەبێت واتە دایك وکچی شیریو خوشك وپور چ خوشکی دایکی یان باوکیو کچی برای شیری هەتا بڕواتو کچی خوشکی شیری هەتا بڕوات ژنی کوڕی شیری ژنی کوڕی کوڕی شیری هەتا بڕوات، ئینجا یەکێکی تر لەو ئافرەتانەی کە حەرام دەبن لە سەر پیاو بریتیە لە ژنانی کوڕی نەسەبیتان. بەم نەسەبیە لابردنی بە کوڕ کردنی (التبنی) مەبەستە کە ئیسلام ئەمەی هەڵوەشاندوەتەوە. وە هەروەها حەرامە کۆ کردنەوەی دوو خوشك، مەگەر بۆ ئەو کەسەی کە پێش هاتنی ئەم حوکمە ئەو شتەی ئەنجام دابێت، ئینجا دەفەرموێ: بە بێگومان کەﷲ لێبوردەو بە سۆزە بۆ بەندەکانی ئەگەر کەسێك یەکێك لەو تاوانانەی ئەنجام دا لە پاشان تەوبەی لێ کرد با دڵنیا بێ کە خوا لێی خۆش دەبێت، چونکەزۆر میهرەبانە. ئیبنو عەباس دەڵێت خەڵکی نەفام هەرچی خوا حەرامی کرد بو بە حەرامیان دائەنا بێجگە لە نیکاحی ژنی باوكو کۆکردنەوەی دوو خوشك بۆیە خوا ئەم ئایەتانەی رەوانە کرد: یەکەم ﴿ وَلَا تَنكِحُوا۟ مَا نَكَحَ ءَابَآؤُكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا قَدْ سَلَفَ ﴾ دووهەم: ﴿وَأَن تَجْمَعُوا۟ بَيْنَ ٱلْأُخْتَيْنِ﴾ ئینجا ﷲ باسی بەشێکی ترمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٤) وە ئەو ئافرەتانەی کەوا خاوەن مێردن بۆ کەسی تر حەڵاڵ نین مەگەر ئەوەی کە ببێت بە موڵکی خۆتان ئەمانە گوێ نادرێت پێیان مادام لە شەڕا گیران، یان بەکڕین بون بەموڵکتان کتێبەکەی

وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۖ كِتَٰبَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ وَأُحِلَّ لَكُم مَّا وَرَآءَ ذَٰلِكُمْ أَن تَبْتَغُوا۟ بِأَمْوَٰلِكُم مُّحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ۚ فَمَا ٱسْتَمْتَعْتُم بِهِۦ مِنْهُنَّ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ فَرِيضَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا تَرَٰضَيْتُم بِهِۦ مِنۢ بَعْدِ ٱلْفَرِيضَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (٢٤) وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن فَتَيَٰتِكُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَٰنِكُم ۚ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۚ فَٱنكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَءَاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ مُحْصَنَٰتٍ غَيْرَ مُسَٰفِحَٰتٍ وَلَا مُتَّخِذَٰتِ أَخْدَانٍ ۚ فَإِذَآ أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَٰحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى ٱلْمُحْصَنَٰتِ مِنَ ٱلْعَذَابِ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِىَ ٱلْعَنَتَ مِنكُمْ ۚ وَأَن تَصْبِرُوا۟ خَيْرٌ لَّكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٢٥) يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٢٦)

خوا بگرنو دەستورەکانی خوا جێ بە جێ بکەن بێجگە لەوانەی کە وتمان ئیتر حەڵاڵە بۆتان، بەمەرجێك بەماڵی خۆتان واتە مارەی بدەن بەو ئافرەتانەو پیاو چاك بن نەزینا کارو داوێن پیس بن. جا ئەگەر لەزەتتان وەرگرت لەو ئافرەتانە بە بەڵێندانی مارەییەکەیان سائیتر ئەو مارەییانە پێ بدەن چونکە ئەوەشتێکی فەرزو دانراوەومافی خۆیانە، مەگەر خۆیان عەفوتان بکەن. بەڵام گوناح نیە بۆتان لەوەی کە رازی دەبن لە بەینی خۆتاندا لە دوای دیاری کراوەکە بۆ نمونە کابرا بڕیاری داوە هەزار دیناری پێبداتو مارە بڕاوەولەسەری بەڵام ئافرەتەکە بڵێت پێنجسەد دیناری وەردەگرم یان کابرا بڵێت: هەزارو دووسەد دیناری پێ دەدەم، بەبێگومان کە ﷲ زانەرەو ئیشەکانیشی بە حیکمەتە. بەڵێ مارەیی پێویستە ئەگەر مارەی نەدەن بە ئافرەت، ئەو ژنە حەڵاڵ نابێت بۆ ئێوە مەگەر ئافرەتەکە خۆی بڵێت نامەوێ. چونکە جارێکیان ئافرەتێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ وتی: من حەز دەکەم بمکەی بە هاوسەری خۆت. پێغەمبەرﷺ سەرێکی هەڵبڕیو تەماشایەکی کردو فەرموی: من ئیحتیاجیم بە ژن نیە. سەحابەیەکی تر دانیشتبو وتی: مارەی بکە لە من. فەرموی: چیت بۆ پەیدا دەبێت بیهێنە، هیچی پێ پەیدا نەبو پاشان فەرموی: بڕۆ ئەنگوستیلەیەك بهێنە بۆم، گەڕا پێی پەیدا نەبو سەحابەکە وتی: کراسێکم هەیە لە سەر ئەو کراسە مارەی ببڕە بۆم، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەو کراسە چی لێ بکات، ئەگەر ئەو دەی دا بە خۆیدا تۆ روتی، وە ئەگەر تۆ دەی دەی بە خۆتا ئەو

وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمٗا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡۚ وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفٗا ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَتَمَنَّوۡاْ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعۡضَكُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبُواْۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٞ مِّمَّا ٱكۡتَسَبۡنَۚ وَسۡـَٔلُواْ ٱللَّهَ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٣٢﴾ وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلۡوَٰلِدَانِ وَٱلۡأَقۡرَبُونَۚ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾

روته ئەوە نابێت. کابرا بەبێنێك دانیشتو ئینجا هەڵساو ڕۆیشت پێغەمبەری خواﷺ بانگی کردو فەرموی: چەندێك قورئانت لە بەرە وتی: فلاَنە سورەتو فلاَنە سورەت فەرموی: باشە مارەی دەبڕم لە سەر ئەو سورەتانە کە فێری بکەیت، ئینجا لە سەر ئەوە مارەی بڕی. واتە بە بێ شتێك مارەیی نابێت. کەواتە ئەو ئافرەتە بە هۆی ئەو شتەوە حەلاَڵ بوە.

تێبینی: یەکەم - ئافرەتی مێرد داری کافر کە گیرا دەبێ عوزرێکی ژنانە بشۆرێت ئینجا دروستە ئەو کەسەی کە بەری کەوتوە بچێتەلای. دووهەم - ئافرەتی موشریكو بت پەرست حەلاَڵ نیە بۆ موسڵمان تەنها ئافرەتی کتێبی حەلاَڵە بۆ نیکاح کردن، بەلاَم ئەگەر غەنیمەت بو ئەوانیش حەلاَڵن. سێهەم - پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {يَحْرُمُ مِنْ الرضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنْ النسَبِ /مسلم/ حەرام دەبێت بە شیر ئەوەی کە حەرام دەبێت بە نەسەب}

چوارەم - ئەو ژمارە شیرەی کە مەحرەمیەت پەیدا دەکات لە نێوان زانایاندا ناکۆکی تێدایە: هەندێك دەڵێن هەر شیردان بوو ئیتر مەحرەمیەت پەیدا دەبێت بە گوێرەی رواڵەتی ئایەتەکە ئەمە قسەی ئیمامی مالیكو سەعیدی کوری موسەیبو عوروەی کوری زوبەیر زوهریەو دەڵێن: عەبدوڵای کوڕی عومەریش قسەی وابوە. هەندێکی تر دەڵێن لای خوار سێ جارە لە بەر ئەوەی کە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {لَا تُحَرمُ الْمَصةُ وَالْمَصتَان /مسلم/ حەرام ناکات شیردانی جارێك ودوو جار} ئەمەش قسەی ئیمامی ئەحمەدو اسحاقو ابو عوبەید ابو سەورەوە لە عائیشەو عەلیو عەبدوڵای کوڕی زوبەیرو سولیمانی کوڕی یەسارو سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە باسکراوە. بەشی سێهەم دەڵێن بەلای کەم پێنج جارە لە بەر ئەو فەرمودەیەی کە دیسان (مسلم) لە عایشەوە دەیگێرێتەوەو دەڵێت: لەوانەی کە رەوانە کراوە لە قورئاندا ئەمە بوە: {عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرمْنَ ثُم نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ فَتُوفيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَهُن فِيمَا يُقْرَأُ مِنْ الْقُرْآنِ /دە جار شیردانی زانراو حەرامیەت دروست دەکەن لە پاشان ئەم دەیە هەڵوەشایەوە بە پێنج جاری زانراو لە پاش ئەمە پێغەمبەری خواﷺ لە دنیا دەرچوە ئەوانە لە قورئاندا دەخوێنرانەوە} ئەمەش قسەی ئیمامی شافیعی یە، وە دەبێ ئەو شیرپێدراوە لە تەمەنی دوو ساڵی تێ نەپەڕی بێت.

چوارەم: لە غەزای ئەوتاسدا هەندێ ئافرەتی مێرد دار کەوتە بەر دەستی موسڵمانانو پێیان خۆش نەبو بچنە لایان ئایەتی ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ إِلَّا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ﴾ النساء: ٢٤ دابەزی (مسلم وغ ه). ئینجا ئەبو سەعید دەڵێت: ئیتر بە حەلاَڵمان دانا. لە پێشدا وتمان: پاش تەواو بونی عوزرێکی ژنانە.

پێنجەم: نیکاحی کاتی (ا نعة) کەلەسەردەمی نەفامیدا باوبوە حەرامەو چەندین فەرمودەی راستی لە سەرە وەك دەفەرموێ: {إن النـ ﷺ نَهى عَنْ الْمُتعَةِ وَعَنْ لُحُومِ الْحُمرِ الْأَهْلِيةِ زَمَنَ خَيْبَرَ /منفق علية/ پێغەمبەرﷺ لە کاتی سەرکەوتنی خەیبەردا بەرگری کرد لە نیکاحی کاتیو لە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی}

(٢٥) هەر کەسێك لە ئێوە توانای ماڵی نەبو کە ئافرەتێکی ئازادی ئیماندار نیکاح بکات جا با لەو کچانەی کە بە دەستتان دەکەوێت بە موڵك لەو کەنیزە باوەڕدارانە نیکاح بکەنو خوا چاك دەزانێ بە ئیمانتان کە هەندێکتان قەوموخوێشی هەندێکتانن جا بە ئیزنی ئەهلەکەیان نیکاحیان بکەنو بە گوێرەی باوی سەردەم مارەییەکەیان پێ بدەن کە ئەوانیش داوێن پاك بنو زیناکەر نەبنو دۆستی ژێر بە ژێریان نەبێت جا هەرکاتێ مێردیان کردپاشان زینایان کرد ئەوە نیوەی سزای ئافرەتی ئازادیان لە سەرە واتە ناکوژرێن تەنها پەنجا داریان لێ دەدەن، چونکە نیوە کوشتن نیە ئا ئەم بڕیارە کاتێك رەوایە کە ئێوە ترسی زیناتان ببێت، وە ئەگەر سەبر کەنو خۆتان بگرن لەوجۆرە نکاحە باشترە بۆتان، وە بەراستی ﷲ زاتێکی لێبوردەو بێنیهایەت بە سۆزە بۆ بەندەکانی.

(٢٦) ﷲ دەیەوێت بەم شێوەیە رۆشنی بکاتەوە بۆتان کە چیتان بۆ حلاڵەو چیتان بۆ حرامەو رێنمایتان بکات بۆ رەوشتی جوانی خەڵکانی پێش خۆتانو تەوبەتان لێ وەرگرێت، وە بەراستی ﷲ زانەرەو دانایەوئیشەکانی پڕلە حیکمەتە.

(٢٧) خوا دەیەوێت تەوبەلە ئێوە وەرگرێت بەڵام ئەومرۆڤە شەیتان سیفەتانەی کەپەیڕەوی ئارەزۆاتی خۆیانن دەیانەوێت کەئێوەش دوچاری سزاو بەلاَ بکەن بە لادانتان لەرێگای راست بەلادانێکی گەورە.

(٢٨) اللهدەیەوێت ئیش بۆ ئێوە سوك بكات لەحاڵێکدا کە مرۆڤ لاواز دروست کراوەو توانای باری سەختی نیە.

(٢٩) ئەی ئیمانداران ماڵی یەکتر بە ناڕەوا نەخۆن مەگەر ئەو ماڵە بازرگانیەك بێت بە رەزامەندی هەردوولاتان لێی بخۆن، وە خۆتان نەکوژن بەراستی الله بە سۆزە بەرامبەر بە ئێوە. لە ئیبنوعەباسەوە هاتوە { **الرجل يشتري منَ الرجل الثوبَ فيقولُ : إن رضيتُهُ أخذتُهُ وإلا رددتُ معَهُ در ا قالَ: هوَ الذي قالَ اللهُ عز وجل :** ﴿ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ ﴾ /عمدة التفس ، صحح ا د شاكر/ لەبارەی پیاوێك کە لیباسێك دەکرێت لە پیاوێکو پێی دەڵێت ئەگەر رازی بوم پێی ئەوە دەی بەم ئەگینا لەگەڵ دریهەمێکدا دیگەڕێنمەوەبۆت، ئیبنو عەباس وتی: ئەوە ئەو فەرمودەی خودایە کە دەفەرموێ: ماڵی یەکتر بە ناڕەوا نەخۆن}

لە کاتی (زاتو سەلاسیل) دا عەمری کوری عاص فەرماندە بو شەو شەیتانی بو هەوایش زۆر سارد بو نەی وێرا خۆی بشۆرێتو تەیەمومی کردو ئیمامەتی نوێژی بەیانی کرد بۆ جەماعەتەکەیو قسەکەیان گەیاندەوە بەپێغەمبەر ﷺ پێغەمبەریش فەرموی: عەمر تۆ وات کردوە؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خواﷺ زۆر سارد بو ترسام ئەگەر خۆم بشۆرم بمرم وفەرمودەی خوام کەوتەوە بیر کە دەفەرموێ:﴿ وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ ﴾ بۆیە تەیەموم کردو نوێژم کرد{**فَضَحِكَ رَسُولُ ا ﷺ وَلَم يَقُل شَيئا** /مسلم وغ ه / پێغەمبەری خواﷺ پێکەنیو هیچی نەوت}.

(٣٠) هەر کەسێك ئەو ئیشە بکاتوماڵی یەکتر بە دوژمنکاریو ستەم بخوات بەم زوانە ئێمە داخی دەکەین لە ناو ئاگردا و ئەوە شتێکی زۆر ئاسانە لە لای خوا. عەبدوڵا بەجەلی ی وتی: پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: {**كانَ فِيمَنْ كانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ بِهِ جُرْحٌ فَجَزِعَ فَأخَذَ سِكِّينًا فَحَز بِهَا يَدَهُ فَمَا رَقَأَ الدمُ حَتى مَاتَ قالَ اللهُ تَعَالَى بَادَرَنِي عَبْدِي بِنَفْسِهِ حَرَّمْتُ عَلَيْهِ الجَنةَ** /منفق عليه/ پیاوێك لە ناو گەلانی پێش ئێوەدا هەبوە کە برینێکی پێوە بوە جاوەقرەی نەدەگرت ئەوساهەستاو بە چەقۆ دەستێکی خۆی بریوخوێنی نەوستاوە هەتا مرد، جا خوا فەرموی: بەندەی من بە پەلە خۆی هێنایەوە لای من منیش بەهەشتم لێ قەدەغە کرد}واتە خۆکوژی ناڕەوایە. ئینجا دەفەرموێ:

(٣١) ئەگەر ئێوە واز بهێنن لەو گوناهە گەورانەی کەبەرگریمان کردوە لێتان لەتاوانە بچوکەکانتان خۆش دەبینو دەتان خەینە شوێنێکی زۆر بە رێزو ئیحتیرامەوە. ئیبنوعەباس دەڵێ: هەر گوناهێك هەڕەشەی ئاگر یان رقی خوا یان نەفرین یان سزای لە سەر دانرابێت ئەوە گوناهی گەورەیە . وە دەڵێ: تاوانی گەورە لە حەوت سەدەوە نزیکترە تا حەوت بەڵام هیچ گوناهێك گەورە نیە کە **(اسنغفاری)** لێ بکرێت، وە هیچ گوناهێکیش بچوك نیە مادام دەوامی لە سەر بکرێت. پاش ئەمە حوکمێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٢) خۆزگە مەخوازن بەوەی کە خوا داوێتی بە هەندێکتان لەپلەومەقامی دنیاییودەوڵەمەندی، بۆ پیاوان لەوەی کە بە دەستی دێنن بەشێك هەیەو بۆ ژنانیش لەوەی کە بە دەستی دێنن بەشێك هەیە جا خۆزگە مە خوازان بەڵکو داوای ماڵو سامان هەر لە خوا بکەن، چونکە هەر خۆیەتی ماڵ دابەش دەکاتو دەیدات بە هەندێكو نایدات بە هەندێکی تر، بەبێگومان کە الله عیلمی بە هەمو شتێك هەیەو بە گوێرەی ئەو زانینەی هەندێکی دەوڵەمەند دەکات و هەندێکی هەژار کەوابو هەر لە خۆی بپاڕێرەوەو داوای نیعمەتی لێ بکە بەڵکو سۆزی بخاتە کار بۆ تۆش وەڵامی دوعاکەت بداتەوە. جا بە ورد بونەوە لەم ئایەتە چەند حوکمێکی گرنگ وەردەگرین یەکەم - هەر کەسێك کەسابەتی کرد بەرهەمەکەی دەبێت بە موڵکی، پیاو بێت یان ژن بێت.

دووهەم - هەردووکیان دەتوانن کەسابەت بکەن.

سێهەم - دان دەنێت بە موڵکیەتی تاکدا.

چوارەم - هاوبەشبونی خەڵك لە ماڵی تایبەتی دا ئەوەتە فەرموی: (مِمَّا ) واتە هەر یەکەی لەوان ئەوەی کە بە دەستی دێنن هەندێکی بۆ خۆیانە نەك هەموی؟!

پێنجەم - ئافرەت دەتوانێ هاتوچۆی بازاڕو شوێنەگشتیەکان بکات بۆ کەسابەتی حەڵاڵ بەو مەرجەی ئادابی شەرعی ریعایەت بکات.

شەشەم - موڵکیەتی تاك سنوری هەیە.

حەوتەم - خۆزگە خواستن، ئەگەر بڵێ خۆزگە منیش هەمبوایە بەم مانایە گوناح نیە، بەڵام ئەگەر بڵێی خۆزگە من هەمبوایەو ئەو نەیبوایە گوناحە. ئینجا الله حوکمێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٞ لِّلۡغَيۡبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيّٗا كَبِيرٗا ﴿٣٤﴾ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ شِقَاقَ بَيۡنِهِمَا فَٱبۡعَثُواْ حَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهِۦ وَحَكَمٗا مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرٗا ﴿٣٥﴾ ۞ وَٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنٗا وَبِذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡجَارِ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلۡجَنۢبِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالٗا فَخُورًا ﴿٣٦﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِ وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٣٧﴾

(٣٣) بۆ هەمو مرۆڤێك لە ئەو سەروەتو سامانەی کە دایك وباوكو خزمە نزیکەکانیانو ئەوکەسانەی کە بە عەقدو پەیمان بوە بە دۆستتان بە جێی دەهێڵن، بەشێك هەیە دەی بە ئەوکەسانە هەر یەکەو بەشی خۆی پێبدەن بە بێگومان کە ﷲ بە سەر هەمو شتێکدا حازرو ئاگادارە. لە سەرەتای ئیسلامدا پەیمانێکی برایانە دەبەسترا بەو پەیمانە دەبون بە برای یەکتر ئیتر لە حاڵەتی میرات دا بەشی دەدرا، بەڵام ئەو حوکمە هەڵوەشراوەتەوە والله اعلم. جا بەم شێوەیە خەڵك ئاگادار دەکاتەوە کە نەکەن لەو سامانە کەسێك بێ بەش بکەن یان کەسێك زیاتر لە مافی خۆی پێ بدەن بەڵێ ﷲ بە هەمو خاوەن مافێك مافی خۆی پێداوەو نا بێ دەستکاری فەرمانەکانی بکرێت. جوبەیری کوڕی موتعیم دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {لَا حِلْفَ فِي الْإِسْلَامِ وَأَيمَا حِلْفٍ كَانَ فِي الْجَاهِلِيةِ لَمْ يَزِدْهُ الْإِسْلَامُ إِلا شِدةً /مسلم وغ ة/ هاوسوێن خواری لە ناو ئیسلامدا نیە، بەڵام هەر پەیمانێك لە سەردەمی نەفامی دا بەسرابێت ئیسلام بە هێزتری دەکات} واتەپەیمانە کۆنەکان هەڵناوەشێنێتەوە مادام لەسەر تاوان نەبێو پەیمانی تازەش دانانێت لە ناو موسڵمانا دا چونکە موسڵمانان برای یەکترن ئیترهاوسوێنی مانای چییە؟ پیاوان دوو زیادەیان هەیە بە سەر ئافرەتانەوە یەکێکیان خوا پێی بەخشیوەو بە تەلاشی پیاو نیە کە بریتیە لە ژیریو هۆشێکی وا کە نەیداوە بە ئافرەت وەك لە فەرمودەی (صحیح) دا باسکراوە. ئەویتریان: پیاو ماڵ خەرج دەکات لە هێنانی ئافرەت داو ژیانی دابین دەکات جا ئەویش حەقیەتی فەرمانی مێردی ئەنجام بداتو شتێك نەکات کە لە گەل مێردەکەی دا نەگونجێت. وە ئەم ئایەتانەی کە دێن هەندێك لەو مافانەی پیاو دەست نیشان دەکەنو دەفەرموێ:

(٣٤) پیاوان سەرپەرەشتی ئافرەتانن، کەکۆمەڵگا لەو دوو رەگەز(نێرومێ) دروست بووەو یاسای خوایش یاسایەکی رێك وپێکەو نارێکی وەرناگرێتو دەبێ یەکێك لەو دووانە سەردارو ئەوی تریان فەرمان بەردار بە هۆی ئەوزیادە بەشەی کە ﷲ داویەتی بە هەندێکیان بە سەر هەندێکی تریاندا واتە داویەتی بە پیاوو بەرزی کردوەتەوە بە سەر ئافرەت دا هەر بۆیە پێغەمبەرایەتی نەدراوە بە ئافرەتو نا بێ قیادەی گشتیشی پێ بدرێت، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {لَنْ يُفْلِحَ قَوْمٌ وَلوْا أَمْرَهُمْ امْرَأَةً /البخاری/ رزگار نابێت گەلێك کە ئافرەت بکەن بە سەرپەرەشتی کارو باریان}ئەم زیادە بەشە وەك لە پێشەوە وتمان بەشێکی خواییەو بە دەستی پیاوو ئافرەت نیە، پەروەردگار لە بەر حیکمەتێك کە خۆی دەزانێت وای دروست کردون بۆ جیاوازی دووهەم: بە هۆی ئەوەی کە پیاوان دەبەخشن لە ماڵیان بۆ مارەیی ئافرەتو گواستنەوەیودابین کردنی جێگاو خۆراكو پۆشاك دەی ئیتر کەی مەعقولە ئافرەت بە سەر پیاودا رەئیس بێت. جا ئافرەتە چاکەکان گەردن کەچی مێردەکانیانو پارێزگاری ئابروو شەرەفیانن کاتێ کە مێردیان لا نەبێتو ماڵەکانیان دەپارێزن لەناوچونو خراپ بوون بەوشێوەی کە ﷲ فەرمانی پارێزگاری پێداون، جا ئەو ئافرەتانەی کە بەرامبەر بە مێردەکانیان راست دەبنەوەودەمە دەمەیان لە گەڵدا دەکەنو ئیشەکانیان بە گوێرەی قسەی ئەوان ئەنجام نادەن سەرەتا ئاموژگاریان بکەن ئەگەر ماوەیەك بە سەرا چوو ئامۆژگاری سودی نەبوو جێگای خەوتنیان لێ جیا بکەنەوە ئینجا ئەگەر بەمەش هەر تەمێ نەبونو لەسەرلەجبازی خۆیان هەر بەردەوامبون دەبێ لێیان بدەن، بەڵام پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەو لێدانە نابێت بریندار بکات و نابێ لە دەمو چاوی بدرێت. ئەوسا ئەگەر هاتو ئەو ئافرەتانە ئیتاعەی ئێوەیان کرد بۆتان نیە ئازاریان بدەن بەراستی خوابڵند مەقامو زاڵە بە سەر هەمو شتێکداو گەورەیە. خوا باسی گەورەیی خۆی دەکات واتە ئەی پیاو وا مەزانە کە تۆ زاڵو گەورەیتو ئەو ئافرەتە زەعیفە لە بەردەستدایە هەرچی بە کەیفی خۆتە لە گەڵیدا بکەیت چاك بزانە خوایەکیش هەیە لە تۆ زاڵترەو زۆر گەورەترەو تۆڵەت لێ دەسێنێتو لە دەستی دەرناچیت پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {أَلَا وَاسْتَوْصُوا بِالنسَاءِ خَيْرًا فَإِنمَا هُن عَوَانٌ عِنْدَكُمْ لَيسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُن شَيْئًا غَيرَ ذَلِكَ إِلا أَنْ يَأْتِ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِنَةٍ

فَإِنْ فَعلْنَ فَاهْجُرُوهُن فِي الْمَضَاجِعِ وَاضْرِبُوهُن ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرحٍ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِن سَبِيلًا أَلَا إِن لَكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ حَقًّا وَلِنِسَائِكُمْ عَلَيْكُمْ حَقًّا فَأَما حَقكُمْ عَلَى نِسَائِكُمْ فَلَا يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ مَنْ تَكْرَهُونَ وَلَا يَأْذَن فِي بُيُوتِكُمْ لِمَنْ تَكْرَهُونَ أَلَا وَحَقهُن عَلَيْكُمْ أَنْ تُحْسِنُوا إِلَيْهِن فِي كِسْوَتِهِن وَطَعَامِهِن/رواه الترمذى وحسنه الالبا / وریابن لەگەل ئافرەتاندا بەچاکی رەفتار بکەن جا بێگومان کە ئەوانە بەندکراوانێکن لەلای ئێوەو ئێوەجگە لەو بەشەدیاریەی ئەوان خاوەنی هیچ شتێکی تری ئەوان نین مەگەر کاری داوێن پیسی بکەن جا ئەگەر شتی وایان کرد لەگەڵیاندا مەخەون‌و لێیان بدەن بەو مەرجەی شوێنیان بریندار نەکەن ئەوسا ئەگەر بەگوێتان بکەن ئیتر ئێوە بۆتان نیە هیچ خراپەیان لەگەڵدا بکەن، ئاگاداربن بێگومان ئێوەبەسەرژنانتانەوەمافتان هەیەو ئەوانیش بە سەر ئێوە مافیان هەیە، جامافی ئێوەی پیاو بەسەرئەوانەوە ئەوەیە کەهەرکەسێك کەئێوە خۆشتان ناوون نەیهێننە سەرجێگای ئێوەو کەسێك کە خۆشتان ناوون ماوەی پێ نەدەن کە بێنە ماڵەکانتانەوە، ئاگاداربن کە ئەوانیش مافیان هەیە بەسەر ئێوەی پیاوەوە کە چاکەیان لەگەڵدا بکەن لەخۆراك‌ولە لیباسیاندا بە گوێرەی عادەت وباوی سەردەم} جا ئەگەر هات‌و ئافرەتێ نەگونجاو بەو تەربیەتەی باسکرا چارەی نەکراو هەر لە سەر بگرەو بەردەی خۆی بو، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٣٥) جا ئەگەر هات‌و هەر نیزاع کەوتە بەینیانەوەو رێك نەدەکەوتن ئەو کاتە باش وایە ناوبژیکەر هەڵبژێرن بە هەردووکیانەوە هەر یەکەی خزمێکی خۆی بکات بە نوێنەری خۆی تا چارەسەری موشکیلەوگرفتەکانیان بکەن ئەگەر ئەمانە ئیرادەی ئاشتکردنەوەیان هەبێت خوا یارمەتیان دەدات بۆرێك خستنیان، چونکە نیەتی چاك لە لایەن هەر کەسێکەوە بێت دەوری خۆی دەبینێ بەبێگومان کەﷲ زانەرەو هەڵس‌وکەوتتان لەو پۆشراو نیەو زۆربەئاگایە. جائێوەش ئاگاتان لێ بێ هەر لە خۆتانەوە بڕیار مەدەن بەڵکو بیر لە بەرژەوەندی هردووکیان بکەنەوە چۆن بە قازانجە بەو شێوەیە بڕیاری بۆ بدەن چونکە ئیسلام بە یەکەوە گونجانی بە لاوە باشترە، ئەو دوو ناوبژیکەرە لە بارەی دانانیانەوەو لە بارەی بڕیاردانیانەوە زانایان ناکۆکیان تێداهەیە، هەندێك دەڵێن حاکم ئەو دوو میانجیگەریە دادەنێت با ئەو پیاوو ژنەیش رازی نەبن کە ئەمە قسەی زۆربەی زانایانە لەوانەش ئیمام ئەبو حەنیفەو قسەی تازەی ئیمامی شافعیشە، هەندێکی تر دەڵێن پیاوو ژنەکە دایان دەنێن. لە بارەی حوکم کردنیانەوە هەندێك دەڵێن تەنها دەتوانین یەکیان بخەن ناتوانین جیایان بکەنەوە مەگەر کرابن بە وەکیل لە لایەن پیاوو ژنەکەوە ئەوە لەو حاڵەتەدا دەتوانن هەردوو بڕیارەکە بدەن واتە کامیان پێ چاك بوو یەکبون یان جیا بوونەوە دەتوانن بیکەن ئەمەش بڕیاری هەمو زانایانی لە سەرە بەڵام ئەگەر نەکرابوون بە وەکیل ئەوە بەشێك وەك پێشوو دەڵێن بەڵام زۆربەی زانایان لە سەر ئەوەن کە دەتوانن هەردوو بریار بدەن یەکبوون یان جیا بونەوە هەر خوایش زانایە:

(٣٦) بەندایەتی ﷲ بکەن‌و هیچ هاوەڵێك بۆ ﷲ دانەنێن‌و لە گەل باوك ودایکتاندا چاکە بکەن، هەروەها چاکەبکەن لە گەڵ خزمی نزیك‌و هەتیوان‌و نەداران‌و دراوسێیەك کە نزیکت بێت لە ماڵدا یان لە خزمایەتیداو دراوسێیەك کە بێگانەبێت یان دووربێت‌و ئەوەش کە وا رەفیقە چ رەفیقی رێگاو ناو سەیارە بێت چ لە ناو ماڵدا بێت کە هاوسەرەکەیشت رەفیقتە، وە لە گەل رێبواردا ولە گەل ئەو کەسانەی کە بە هۆی هێزو سامانتانەوە لە گەڵتانن چاکەبکەن بە بێگومان کە ﷲ ئەو کەسەی کە فەخر فرۆش‌و خۆ بە زل زان‌و لوت بەرزە خۆشی ناوێت. کاتی خۆی هەندێ لە خەڵك بازرگانی پێدەکراو بەندە بوون لە دەستی خەڵکی تردا زۆربەی ئەوانە لە شەڕدا دەگیران‌و دەکران بە بەردەودەفرۆشران واتە ئەگەر ئەوانەتان کڕی پێویستە چاکەیان لە گەڵدا بکەن لە بارەی ئەوانەوە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {إِن إِخْوَانَكُمْ خَوَلُكُمْ /متفق علیه/ بێگومان براتانن ئەوەی کە لە ژێر دەستتانن} جا ئەم ئایەتە ئەو حەیوانانەش دەگرێتەوە کە مرۆڤ راگیری دەکات. ئینجا ﷲ زیا تر ﴿مُخْتَالًا فَخُورًا﴾ مان بۆ رون دەکات‌و دەفەرموێ:

(٣٧) ئەو کەسانەن کە خۆیان بەخیلۆرژدن‌و هیچ شتێك نادەن لە رێگای خواداو یارمەتی فەقیرو هەژارو هەتیوان نادەن‌و بە خەڵکیش دەڵێن بەخیلی بکەن‌و ئەو نیعمەتانەی کە خوا پێی داون ئەو بەخیلانە دەیشارنەوە نە خۆیان دەیخۆن‌و نە بە لیباسیانەوە دیارەو نەشتێك دەدەن بە کەس. دیارە ئەوانە کە خۆیان بەخیلن‌و دەستور دەدەن بە بەخیلی‌و رژدی لە بەخشینی ماڵدا لە بەر ئەوەیە کە باوەڕیان بە رۆژی قیامەت‌و رۆژی پاداش نیە مادام باوەڕیان بە مە نەبو کافرن بۆیە لەکۆتای ئایەتەکەدا دەفەرموێ: وە بۆئەو بێباوەڕانە سزایەکی گاڵتە پێ کەرمان ئامادە کردوە. وە ئەم شاردنەوەیەش سیفەتێکی خراپە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێ: ﷲ پێی خۆشە ئەو نیعمەتەی کە دەیدات بە بەندەی خۆی شوێنەواری ئەو نیعمەتە ببینێ. واتە ئەگەر کابرا ماڵی هەبوو با لیباسی جوان بکات‌و با خۆراکی باش بخوات‌و زیاتر یارمەتی خەڵك بدات. لە بارەی بەندایەتی خواوە پێغەمبەرﷺ بە مەعاز دەفەرموێ: {يَا مُعَاذُ أَتَدْرِي مَا حَق اللهِ عَلَى الْعِبَادِ قَالَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ أَنْ يَعْبُدُوهُ وَلَا يُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا أَتَدْرِي

وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ ٱلضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا۟ ٱلسَّبِيلَ ﴿٤٤﴾

**مَا حَقُهُمْ عَلَيْهِ قَالَ اللهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ أَنْ لَا يُعَذِّبَهُمْ.** /متفق علية/
ئەی مەعاز ئایا دەزانی مافی خوا چیە بە سەر بەندەکانیەوە؟ وتی: خواو پێغەمبەرەکەیﷺ دەزانن فەرموی: ئەمەیە کە بیپەرەستن، وە هیچ هاوەڵێکی بۆ دانەنێن، لە پاشان فەرموی: ئایا دەزانی مافی بەندە چیە لەلای خوا ئەگەر هاتو ئەوەیان کرد؟ وتی: خواو پێغەمبەرەکەیﷺ دەزانن فەرموی: ئەوەیە کە خوا سزایان نەدات} وە لە بارەی دراوسێوە زۆر فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا تەنها ئەم فەرمودەیە باس دەکەین کە دەفەرموێ: {**مَازَالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بِالْجَارِ حَتى ظَنَنْتُ أَنُه سَيُورِثُهُ**/متفق علية/هەمیشە جبرئیل ئاموژگاری دەکردمو بە گوێ دادەدام سەبارەت بە هاوسێ تا وام زانی کە ئەگەر دراوسێ بمرێت دراوسێیەکەی تری میراتی لێ ئەبات} وە لە بارەی ئەو شتانەی کە لە ژێر دەستی مرۆڤ دان پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {**كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ** /مسلم وغ ة/ بەسە بۆ تاوانباری مرۆڤ کەرۆزی بگرێتەوە لەو کەسەی کە رۆزی لە ژێر دەستی ئەودایە} وە دەفەرموێ: {**إِذَا أَتى أَحَدَكُمْ خَادِمُهُ بِطَعَامِهِ فَإِنْ لَمْ يُجْلِسْهُ مَعَهُ فَلْيُنَاوِلْهُ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ أَوْ لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ فَإِنهُ وَلِيَ حَرَهُ وَعِلَاجَهُ** /متفق عليه/ هەر کاتێ کە خزمەتکاری یەکێ لە ئێوە خواردنی بۆ هێنان‌و دانەنیشت لە گەڵتاندا بۆ خواردن، پارویەك یان دوو پاروی پێ بدەن، چونکە ئەو گەرمایی دروست کردنەکەی چەشتووە خواردنەکەی دروست کردوە} جا تەماشا بکەن بزانن ئەم ئایینە چۆن خزمەتی مرۆڤ دەکات‌و لە هەمو هەنگاوێکدا بە گوێرەی پێویست یاسای بۆ دادەنێت‌و ئامۆژگاری دەکات، ئینجا اللّٰه سیفەتێکی تری ئەو لوت بەرزو خۆبەزل زان‌و سپڵەیانە بۆباس دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٣٨﴾ ئەوانەی کە ماڵ دەبەخشن لە بەر ئەوەی کەخەڵك بیان بینێ‌و باسیان بکات، نە باوەڕیان هەیە بە خواو نە باوەڕیان هەیە بە رۆژی دوایی ئەوکەسە شەیتان رەفیقیەتی‌و هەرکەسێکیش کە شەیتان رەفیقی بێت بەراستی پیسترین رەفیقی هەیە. لە بارەی عەبدوڵای کوری جەدعانەوە پرسیار کرا کە کابرایەکی سەخی تەبیعەت‌و نانده‌رو خزم دۆستبوە ئایا سودی دەبێت بۆی؟ فەرموی: {**لَا يَنْفَعُهُ إِنهُ لَمْ يَقُلْ يَوْمًا رَب اغْفِرْ لِي خَطِيئَتِي يَوْمَ الدين**/مسلم/ نە هیچ سودێك بەو نادات، چونکە رۆژێك لە رۆژان نەی وتوە: ئەی پەروەردگارم لەرۆژی دواییدا لەتاوانەکانم خۆشببە}واتەباوەڕی بە رۆژی دوای نەبووەو باوەڕیش بناغەیە بۆ شتەکانی تر. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٣٩﴾ دەی چ زیانێکی دەبو بۆیان‌و چ شتێك رێگەی لێ گرتبون ئەگەر ئەوان ئیمانیان بهێنایە بە خواو بە رۆژی دوایی‌و لەوەی کە خوا پێی دابوون بیان بەخشییایە؟ وەبەراستی اللّٰه زانا بو بەوان‌و پاداشتی چاکی پێ دەدان، بەڵام ئێستە رەنجەڕۆو سەروماڵ فەوتاون.

﴿٤٠﴾ بە بێگومان کە اللّٰه بە ئەندازەی یەك زەڕە ستەم لە کەس ناکات‌و ئەگەر مرۆڤ یەك چاکە بکات اللّٰه بۆی دوو بەرامبەر زیاد دەکات، سەرەرای ئەوەش لە لایەن خۆیەوە پاداشتێکی گەورەی پێ دەداتەوە. جا شتێك خوا بە گەورەی دانابێت دەێ دەبێ چەند بێ؟ ئەو چاکەیە لە دە بەرامبەرەوە بۆ زیاتر دەبات، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {**مَنْ دَخَلَ سُوقاً من الأسواقِ فقال:"لا إله إلا ا وحده لا شريكَ لَهُ، له ا لملكُ، وله ا مدُ، وهو على كل شيءٍ قديرٌ"كَتَبَ ا له ألفَ ألفِ حسنةٍ، و ا عنه ألفَ ألفِ سيئةٍ** /الط ا ،صححه الالبا / هەرکەسێك کە بچێتە ناو بازاڕ ئەگەر ئەمە بخوێنێت(**لاَ إِلَهَ إِلا اللهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ،..../** یەك ملیون چاکەی بۆ دەنوسرێت‌و یەك ملیون خراپەی لەسەرلادەبرێت} خوا خاوەنی ئەو بەخششە گەورەیە. ئینجا لە دنیادا سرنجمان بەرەو رۆژی دوایی رادەکێشێت‌و دەفەرموێ:

﴿٤١﴾ ئەبێ چۆن بێت وەزعی خەڵك لەو رۆژەدا کە هەمو ئوممەتێك لە گەل شایەتەکەی دا دێت بۆ دادگای خوا؟ وە ئەو کاتە کە تۆش دەهێنین ئەی محمد ﷺکە شایەت بیت لە سەر ئەم ئوممەتە. لە رۆژی قیامەتدا هەمو ئومەتان کۆ دەکرێنەوە

بەخۆیانو بە شایەتیەکانیانەوە کە پێغەمبەرانو پیاو چاکانی هەمو زەمانەیەکەو پێغەمبەریش دەهێنرێت کە شایەتی بدات لە سەر گەلەکەی خۆیو ئەوانیش. لە ریوایەتدا هاتوە کە رۆژی قیامەت دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەت دەکات ئیجازە دەدرێت بە پێغەمبەرانی تر کە شفاعەت بکەن. هەمو پێغەمبەرێك لە دادگای خوادا دەڵێت یارەبی من پەیامی تۆم گەیاندوەو ئومەتەکەی ئینکاری دەکات، ئینجا بە پێغەمبەران دەوترێت کێ شایەتە دەڵێن ئۆمەتی محمد ﷺ ئەوانیش دەڵێن: چۆن قەبوڵ دەکەین، ئەوان لە پاش ئێمە هاتون ئەوان چی دەزانن کە ئێمە چیمان کردوە؟ اللَّهُ بانگی ئەم ئومەتە دەکات ئایا ئێوە شایەتن لە سەر ئەوەی کە ئەو پێغەمبەرانە پەیامەکەی منیان گەیاندوە ئەوانیش دەڵێن: بەڵێ ئێمە شایەتین بۆ ئەو پێغەمبەرانە. جا خوا دەفەرموێ: بەڵگەتان چی یە؟ دەڵێن: بەڵگەمان ئەوەیە کە باوەڕمان بو بە کتێبەکەی تۆ کە قورئانەو بە پێغەمبەرەکەی تۆ کە ناردووتە بۆمانو لەو قورئانەدا بە ئێمەت فەرمو بو کە ئەوان تەبلیغیان کردوە، بەڵام ئومەتەکەیان بە گوێیان نەکردونو سزات بۆ ناردنو لەناوت بردون، ئێمە لە سەر فەرمودەی خۆت شایەتی دەدەین ئەو کاتە بانگی پێغەمبەر ﷺ دەکات ئایا تۆ شایەتی لە سەر ئەم گەلەی خۆت کە راست دەکەن؟ پێغەمبەر ﷺ شایەتی دەداو دەفەرموێ: بەڵێ ئۆمەتەکەم راست دەکات. ئینجا حوکم دەکرێت لە نێوان پێغەمبەرەکانو ئوممەتەکانیان دا. بەڵێ تا ئەو شایەتی نەدات حوکم ناکرێت، ئیبنو مەسعود دەڵێ: پێغەمبەرﷺ پێی وتم: هەندێ قورئانم بۆ بخوێنەوە وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من قورئان بۆ تۆ بخوێنمەوە کە قورئان بۆ تۆ هاتوە فەرموی: {فَإِنِي أُحِب أَنْ أَسْمَعَهُ مِنْ غَيْرِي فَقَرَأْتُ عَلَيْهِ سُورَةَ النِّسَاءِ حَتى بَلَغْتُ ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴾ قَالَ أَمْسِكْ فَإِذَا عَيْنَاهُ تَذْرِفَانِ /منفق عليه/ بەڵێ من پێم خۆشە لە غەیری خۆمەوە ببیستم. منیش سورەتی نیسائم خوێندەوە هەتا گەیشتە ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ... ﴾ پێغەمبەری خوا ﷺفەرموی: بەسە. دەڵێت کاتێك کە تەماشام کرد دەبینم فرمێسك بە چاوەکانیدا دێتە خوارەوەو ئەگری} چونکە رۆژێکی ئەوەندە سەختە. هەتا لە ریوایەتێکی تردا دەفەرموێ: یا رەبی من شایەتم لە سەر ئەوەی کە خۆم بینیومن ئەی چۆن شایەت بم لە سەر ئەوەی کە لە دوای خۆم دێت (ابن ابی حاتم) بەڵام اللَّهُ دەی هێنێت بۆ دادگاو ئەمە ئیشێکی ئاسان نیە. وە لە فەرمودەدا هاتوە کە هەمو رۆژێ دوو جار تاقی بەیانیانو ئێواران کردەوەی هەمو ئەم ئۆمەتی پێغەمبەر ﷺ پیشانی پێغەمبەری دەدرێت هەتا بچوکترین شت کە پەلکە پوشێك بێت کە لە مزگەوتا فڕێ یان دابێت نوسراوەو دەی بینێ کەوابو لە سەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەتوانێ شایەتی بدات.

بزانە ﴿ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ ﴾ دەگونجێت پێغەمبەرﷺو پیاو چاکان یان ئۆمەتانی پێشو، یان ئۆمەتی خۆی بێت یان هەمویان مەبەست بێت. هەر خوایش دەزانێت واتە بۆ شایەتی لە سەر هەمویان.

(٤٢) ئەو رۆژە رۆژێکە کە بێباوەڕانو ئەوانەی کە فەرمانی پێغەمبەریان شکاندوە ئاوات دەخوازن کە لەتەك خاکدا یەکسان ببونایەو ئەم رۆژە سەختەیان چاو پێ نەکەوتایە هەروەکو دەڵێن: خۆزگە هەر خاك بوینایە ﴿يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا﴾ النبأ: ٤٠ بەڵێ ئەو رۆژە ئاوات دەخوازنو دەڵێن: خۆزگە هەر نەبوینایەو ئەوان ئەو کاتە ناتوانن یەك قسە لە خوا بشارنەوە هەرچیان کردوە هەموی دیارە. وە لە ئایەتدا هاتوە کە لە رۆژی قیامەتدا موشریکەکان دەڵێن: ﴿ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ ﴾ الأنعام: ٢٣/ سوێند بە اللَّهُ بە پەروەردگارمان ئێمە هاوەڵمان دانەناوە﴾ بەڵێ سەختی ئەو رۆژە هەمو شتیان لە بیر دەباتەوە ﴿ وَتَنسَوْنَ مَا تُشْرِكُونَ ﴾ الأنعام: ٤١/ لە بیرتان دەچێتەوە ئەو هاوەڵانەی کە داتان نابون بۆ خوا﴾ بەڵێ ئەو پاڵەوانانەی کەبەناڕەوا لە دنیادا خۆیان هەڵدەکێشن بە سەر خاوەن باوەڕانولاوازان داو بە بێ باوەڕیو گومڕاهی خۆیان شانازی دەکەنو ئەو ئیشەی خۆیان بە پێشکەوتن وشارستانی دەزانن ئالەو رۆژەدا هەردەمێك قسەیەك دەکەن جارێك ئاواتی مەرگ دەخوازنو جارێك دەڵێن: خۆزگە هەر نەبوینایەو جارێك دەپاڕێنەوەو سوێند بە خوا دەخۆن کە هاوەڵیان بۆ خوا دانەناوەو جارێك دەڵێن: شەیتان ئێمەی خەڵەتاندوەو هەندێ کاتیش دەڵێن: بمان خەرەوە دنیاو جارێکیش دەڵێن: گەورەو سەرۆك خێڵەکەمان گومڕاهی کردینو جارێکی تر نەفرین لە یەکتر دەکەن. ..جارێکی ترو..جارێکی تر. بەڵام بێ سودەو کار لە کار ترازاوە. ئینجا حوکمێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٣) ئەی ئیمانداران نزیکی نوێژ نەکەونەوە لە حاڵەتێك دا کە ئێوە سەرخۆشبن تا بزانن چی دەڵێن، چونکە نوێژ دەبێ ئاگاتان لێ بێت کەچۆنی دەخوێنن، ئەمەش تێمان دەگەیەنێت کە پێویستە نوێژ بە ئاگاییەوە بکرێت جا ئەو خەڵکەی کە ئاوەها بێ ئاگا نوێژ دەکاتو نازانێت چی دەڵێت وەکو سەرخۆشێك وایە، ئەوەندەی هەیە کەگوناهی نەکردوەو بەس. جا چونکە لە نوێژدا دوو شت زۆر گرنگە یەکەم: ئاگاییو گەردن کەچی کە سەرخۆشی

دژیەتیو قەدەغە کرا. **دووەهەم**: پاك وخاوێنی کە لەم بارەیشەوە دەفەرمووێ: نا بێ لە حاڵەتێکدا کەلەشتان پیسبو نزیکی نوێژ بکەونەوە مەگەر کەسێك کە ڕێبوار بێت هەتا خۆتان دەشۆرن، واتە، بە لەش پیسی نوێژ دروست نیە، ئینجا خوای میهرەبان ودانا سەبارەت بە کەسانێك کەنەتوانن ئاو بە کار بهێنن چ لە بەر نەبونی ئاو بێت یان نەتوانرێت ئاو بە کار بهێنرێت دەفەرمووێ: ئەگەر ئێوە نخۆشبون یان لە سەفەردا بون یان دەستتان گەیاند بە ئاو یان لە گەل ژنانتاندا هاوجێگابون جا ئاوتان دەست نەکەوت ئەوسا خاکێکی پاك پەیا بکەن ئینجا دەستبێنن بە دەم وچاوتان ودەستەکانتان، بەبێگومان کەاللّٰه چاوپۆشی دەکات لە تاوانو زۆر لێ خۆشبوە.

﴿ٱلۡغَآئِطِ﴾ واتە شوێنی نزم مەبەسست پێی پیسیو میز کردنە

بەڵام ئەسڵی ﴿ٱلۡغَآئِطِ﴾ واتە شوێنی نزم، چونکە پیسی تێدا دەکرێت یا تەوقە سەری چیایەکیش بێت بەڵام هەر جێگایەك شتی باشی تێدا بکەیت بەرزە یا نزمترین دۆڵ بێت وەك خاکی تەیەموم دەفەرمووێ:﴿**صعیدا**﴾ واتە شوێنی بەرز. چونکە دەست نوێژ کارێکی پیرۆزە، ئەگەر لە نزمترین شوێندا بێت شوێنەکەی هەر بە بەرز تەماشا دەکرێت.

لە بارەی چونیەتی تەیمومەوە دوو قسە هەیە بۆ دەستەکان هەندێك دەڵێن: تا موچە. هەندێکیش دەڵێن: تا ئانیشکە، دوو جار دەست لە خاکێکی پاك دەدەیت جارێکیان لە گەڵ نیەتدا بە دەم وچاودا دەیهێنیتو جارێکی تر دەست دەدەیت لە خاك دەستت بە یەکێك لەو شێوازەی کە وتمان: مەسح دەکەیت ئەمە چ بۆ بێ دەست نوێژی بێت چ بۆ لەش پیسی بێت. سەبارەت بە ئاگایی لە نوێژدا ئەگەر کەسێك ئەوەندە خەوی دەهات نەی دەزانی چی دەڵێت یان میزو پیسی زۆری پێ هێنابو لەم کاتانەدا نا بێ نوێژ بکات، چونکە ئاگای لە نوێژەکە نیە.

وە وشەی ﴿لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾واتەلەمسی ژنانتان کرد جا زانایان لە بارەی لەمسەوە دوو مانا یان کردوە هەندێکیان بە لەیەك کەوتنی پێستی ئافرەتو پیاوی دەزانن وەك ئیمامی شافعی. هەندێکی تریان بە مانای جیماعی دەزاننو هەر کەس لەوانە بۆ خۆیان بەڵگەیان هەیەو ڕێگەی ورد بوونەو فەهم کردنشیان لە کەس قەدەغە نەکردوە، لە قورئاندا لەمس بە هەردوو مانا هاتوە بە مانای دەست لێ دان ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمووێ: ﴿أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَ﴾ طه: ٩٧/ واتە نەخۆشیەك بگرێت بڵێت کەس دەستم لێ نەدات﴾ وە بە مانای جیماع ئەم ئایەتانەن: **یەکەم** ـ دەفەرمووێ: ﴿وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٌ﴾ مريم: ٢٠/ کەس دەستی لێ نەداوم﴾ ئەگەر

لەمس بە مانای دست لێ کەوتن بێت ئەی دایك یان کەسو کاری دەستی لێ نەداوە؟ کەوابو مەبەستی ئەوەیە کە کەس جیماعی لە گەڵدا نەکردوە. **دووەهەم**: لە سورەتی بەقەرەدا دەفەرمووێ: ﴿لَّا جُنَاحَ عَلَيۡكُمۡ إِن طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمۡ تَمَسُّوهُنَّ أَوۡ تَفۡرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةٗ﴾ البقرة: ٢٣٦ /گوناهتان ناگاتێ ئەگەر ژنانتان تەلاق بدەن پێش ئەوەی کە جیماعیان لە گەڵدا بکەنو شتێکیان بۆ پێویست بکەن﴾ هەر لە ئایەتی پاش ئەوەی بەقەرە ﴿وَإِن طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ﴾ البقرة: ٢٣٧ /ئەگەر تەڵاقتان دان پێش ئەوەی کەجیماعیان لە گەڵدا بکەن﴾ لێرەش مانای جیماعە، ئیمامی ئەبو حەنیفە ئەوانە دەکات بە بەڵگە لە سەر قسەکەی خۆیو دەڵێت (**س**) بە مانای جیماعەو (ابن عباس)یش وا دەڵێت. هەر خوا زانایە. خوای داناو میهرەبان پاش ئەوەی کە چەندین تەکلیفی باس کرد، ئاگادارە لە سەر تەمەڵیو سستی کردنی مرۆڤ لە بەر ئەوە هات باسی نوێژی بۆ کرد، چونکە یەکێك بەڵکو گەورەترین یارمەتی دەری مرۆڤەو مەڵهەمی برینەکانیو دلخۆشکەریەتی وەك لە سورەتی بەقەردا دوو جار فەرموویەتی: ﴿یارمەتیو کومەك وەرگرن بە خۆگریو بە نوێژ﴾ هەروەها پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەر کاتێ باری سەخت ببوایەو دڵی نارەحەت ببوایەو کاتی نوێژ بهاتایە دەیفەرمو: ئەی بیلال بانگ بدەو کەیف خۆشمان بکە. وە ئەم نوێژە بەرەو پاك وخاوێنی دەروونو لیباسو جێگا رامان دەکێشێتو لە خواوە نزیکمان دەکاتەوەو دەبێتە هۆی ترسان لە خوا کە مەبەستی سەرەکی ئەم سورەتەیە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ﴾ النساء: ١. بزانە کە ئایەتی تەیموم لە سورەتی مائیدەیشدا هەیە، بەڵام لە بەر ئەوەی کە ئەم ئایەتەی (**النساء**) پێش ئایەتی(**المائدە**) هاتوە چونکە ئەم ئایەتە پێش حەرام بونی عارەق هاتوە وە حەرام بونی عارەق دوای جەنگی ئوحود کاتی گەمارۆدانی جولەکەکانی بەنی نەزیر کەمێ دوای ئوحود حەرام کراوە بەڵام (**المائدە**) لە ساڵانی دوایدا هاتوە بە تایبەت سەرەتاکەی لە بەر ئەوە باسکردنی لێرەدا شتێکی گونجاوە. ئیمامی بخاری لە عائیشەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: لەگەل پێغەمبەردا ﷺ بوین لە سەفەرێ لە سەفەرەکانیدا تا گەیشتینە (**بەیدا**) یان (**زات ا بش**) کە دوو جێگای نزیکی شاری مەدینەن گەردن بەنەکەم بچراو لێم ون بوو پێغەمبەر ﷺ مایەوە تا بەڵکو بیدۆزینەوە و خەڵکەکیش لە گەڵیدا مایەوەو نە لە سەر ئاو بوینو نە خەڵکیش ئاوی پێ بو جا خەڵك چوونە لای ئەبوبەکرو وتیان: مەگەر نابینی عائیشە چی کرد؟ پێغەمبەری خوا ﷺ و خەڵکی ماتەڵ کرد نە لە سەر ئاونو نە

ئاویشیان پێیە، ئیتر ئەبوبەکر هات لە کاتێکدا کە سەری پێغەمبەر ﷺ بە سەر ئەژنۆم بو کە خەوی لێ کەوتبو وتی: پێغەمبەری خوا ﷺو خەڵکت بەستەوە نە لە سەر ئاونو نەئاویشیان پێ یە؟ عائیشە دەڵێت: ئەبوبەکر زۆر سەرزەنشتی کردمو ئەوەی خوا ئارەزۆی لێ بو پێ وتمو یەك گورمشتی کوتایە کەلەکەم، تەنها لە بەر خاتری خەبەر نەکردنەوەی پێغەمبەر بو نەجولام، پێغەمبەر ﷺ بەیانی خەبەری بووەوە بە بێ ئاو، ئینجا خوا ئایەتی تەیمومی رەوانە کردو خەڵکی تەیمومیان کرد. ئوسەیدی کوڕی حوزەیر وتی: ئەمە ئەوەڵ بەرەکەتی ئێوە نیە ئەی خێڵی ئەبو بەکر، عائیشە دەڵێت جا ئەو وشترەی کە سواری بوم هەڵمان ساندو دیمان گەردن بەنەکە لە ژێر ئەودایە، جا اللّٰه پاش ئەم ئامۆژگاریە بە نرخانە واجارێکی تر پێناسەیەکی تری جولەکەو گاورمان بۆ دەکات، چونکە ئەم دوو کۆمەڵە خۆیان بە خاوەن باوەڕ دادەنێنو دژایەتیەکی زۆر سەختی ئەم ئایینەو پێغەمبەرەکەی خواو خاوەن باوەڕان دەکەنو هەمو شێوازێکی ناشیرین بە کار دەهێنن لەدژیان بۆیە وا قورئان پەردە لە سەر زۆربەی پیلان ونەخشەکانیان لادەداتو نیەتی پیسیان ئاشکرا دەکات تا موسڵمانان دوژمنانی خۆیان بناسنو نەکەونە داوایانەوە جا دەفەرموێ:

(٤٤) ئەی محمد ﷺ تۆ نابینی ئەوانەی کە بەشێك لە کتێبیان پێ دراوە گومڕاهیان کڕیوە بۆ خۆیانو دینەکەیان فرێ داوەو دەیانەوێت بە ئێوەش ڕێگا بزر بکەن، ئەوەش لە بەر ئەوە نیە کە ئێوەیان خۆش دەوێت نەخێر، بەڵکو لە بەر ئەوەیە کە خۆیان ڕێگای ڕاستیان بزر کردووەو پێیان خۆش نیە کەسیش ڕێگای ڕاست بگرێت. ئینجادەفەرموێ:

(٤٥) اللّٰه زانایە بە دوژمنەکانتانو بەسە کە اللّٰه دۆستو یارمەتی دەری مرۆڤ بێ. جاتۆ ئەی باوەڕدار خوا بکە بە دۆستو یارمەتی دەری خۆتو خەفەتت نەبێت ئەو کام ئیش بە سودە وات بۆ دەکات، بەراستی ئەمە موژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ خاوەن باوەڕان کە خواکەی ئاگای لە فرت وفێڵی دوژمنەکانیەتی، جا یان موسڵمانەکان شارەزا دەکات یان فرت وفێڵی ئەوان پەك دەخات. وەدەفەرموێ:

(٤٦) هەندێك لەوکەسانەی کە جولەکەن قسەکانی خوایان گۆڕیوەو ئاینەکەی خۆیانیان تێك داوەو کاتێ کە لە گەڵتان قسە دەکەن دەڵێن: بیستمانو بە هێواشیش دەڵێن: بە گوێت ناکەین، جا دەگونجێت هەروایان وتبێت یان بە کردار وایان کرد بێت کە ئەمڕۆ بە داخەوە زۆربەی خەڵك بەم شێوە رەفتار دەکەن دەڵێت دەزانم کامە چاکەو پێویستە بکرێت کەچی لە کرداریشدا

وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِأَعۡدَآئِكُمۡۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَلِيّٗا وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ نَصِيرٗا ﴿٤٥﴾ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا وَٱسۡمَعۡ وَٱنظُرۡنَا لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ وَأَقۡوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٤٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ أَوۡ نَلۡعَنَهُمۡ كَمَا لَعَنَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلسَّبۡتِۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ مَفۡعُولًا ﴿٤٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفۡتَرَىٰٓ إِثۡمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُمۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ هَٰٓؤُلَآءِ أَهۡدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ سَبِيلًا ﴿٥١﴾

پێچەوانەی زانینەکەی خۆی دەکات. جا بە پێغەمبەر یان ﷺ دەوت: گوێ بگرە، دەك نەبیسی، واتە کەڕبی یان بمری، وە بە تانەو تەشەرو گاڵتەوە دەیان وت: ئەی شوانەکەمان، ئەمە لە ڕواڵەتدا وشەیەکی جوان بو، بەڵام مەبەستی ئەوان خراپ بوو دەیشیان وت: ئەگەر پێغەمبەر بێت چۆن دەبێ لە مەبەستی ئێمە تێ نەگات، بەڵێ جوەکان لە حەوسەڵەو ڕەوشت جوانی پێغەمبەر ﷺبە نارەوا سودیان وەردەگرت، خۆ پێغەمبەر ﷺ زۆر چاك لە مەبەستی ئەوان تێ دەگەیشت، بەڵام ئەو ڕەوشت بەرزو بە حەوسەڵە بو، دەڵێن جارێك کۆمەڵێك جولەکە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺوتیان: (السام عليك يا ابا القاسم) عائیشە وتی: (وعليكم السام). عائیشە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {مَهْ يَا عَائِشَةُ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْفُحْشَ وَالتَّفَحُّشَ /متفق عليه/نەکەی ئەی عائیشە: بەراستی خوا قسەی خراپ کردنو خراپەکاری خۆشناوێت. وتم: ئایا تۆ گوێت لێ نیە ئەوان دەڵێن (مەرگ بۆ تۆ بێت \السام عليك) پێغەمبەری خوا ﷺفەرموی: ئەی تۆ گوێت لێ نەبو منیش وتم: لە سەر ئێوە بێت (وعليكم)؟}. بەڵێ ئەو جولەکە بەد فەسالانە لەم ڕەوشتە جوانەو لەم حەوسەڵەیە خراپ کەڵکیان وەرگرتو ئەو جنێوە خراپانەیان بە خۆشەویست دەوت تا قورئان هاتو هەمو نهێنیو قسە خراپەکانیانی دەرخستو ڕیسوای کردنو فەرموی: ئەوان بەم قسانە کە دەیکەن مەبەستیان ڕواڵەتە چاکەکەی نیە بەڵکو هەر زمان بەقسەکە لار دەکەنەوەو تانەوتەشەر لە ئایین دەدەن. بەڵام خوا خاوەنی سۆزو میهرەبانیە

ئەوەتە ئامۆژگاریان دەكات كە چی بڵێنو دەفەرموێ: ئەگەر ئەوان بیان وتایە بیستمانو بە گوێمان كردیتو گوێ بگرەو چاوت لێمان بێت بەراستی ئەوە باشتربو بۆ ئەوان تا ئەو قسە ناپەسەندانەی كە خۆیان دەیانكردو ئەوە رێگایەكی راستترو بە هێزترو دروستتر بو بەڵام بە هۆی بێ باوەڕیانەوە بە خواو بە پێغەمبەر ﷺو بە بەرنامەكەی، خوا نەفرینی لێكردن جا ئیتر باوەڕ ناهێنن مەگەر كۆمەڵێكی كەمیان نەبێت، واتە خوا ستەمی لێ نەكردون خۆیان ستەمكارن. ئینجا ﷲ بانگیان دەكاتو دەفەرموێ:

(٤٧) ئەی ئەو كەسانەی كە كتێبتان پێ دراوە (تەوراتو ئینجیل) ئیمان بهێنن بەوەی كە رەوانەمان كردوە كە دان دەنێت بەوەی كە لە لای ئێوەدایەو دەڵێت ئەوانە كتێبی خوا بوون، ئێوەش باوەڕ بێنن لە پێش ئەوەی كە ئێمە دەمو چاوتان مەحو بكەینەوەوبەروپشتی بكەینو بیخەینەوە پشتی سەرتان بەرەو دوا بچن بە رێگادا، ئەمە وێنەیەكە خوا هێناویەتی بۆ ئەوان واتە مادەم خۆتان گێل بكەن لە ئایینو پشتی تێ بكەن ئێمەش زیاتر بەرەو گومراهیو نەزانیو كوفر رێنمایتان دەكەین، یان مادام پشت بكەنە ئایین لە كوێ دەركراون بتان نێرنەوە بۆ ئەو شوێنە، بەراستی هەر كەس پشتی كردە ئایین دەبێ چاوەڕوانی هەمو سزایەك بكات، چونكە دژایەتی خوا دەكاتو كەسیش لە دژایەتی خوادا سەر ناكەوێت، دەڵێن: كەعب الاحبار بە بیستنی ئەم ئایەتە ترساو باوەڕی هێنا پێشەكی چەند جار بانگ كرا بو بۆ ئیسلامبون وەری نەگرتبو خوا فەرموی: باوەڕ بهێنن پێش ئەوەی واتان لێ بێت یان نەفرینتان لێ بكەین وەكو چۆن نەفرینمان كرد لە ئەهلی شەممە. واتە ئەوانەی كە بەرگری كران لە رۆژی شەممە كە لەو رۆژەدا نا بێ ئیش بكەن، بەڵام بە فێڵ ئیشیان كرد خوا نەفرینی لێ كردن ئەم داستانە لە ئایەتی سەدوشەستو سێی سورەتی ئەعرافدا هاتوە. وەئەمری خوا جێ بە جێ كراوە كە ﷲ ئیرادەی شتێكی كرد ئیتر بێ پاشو پێش رودەدات. ئینجا ﷲ خراپی شیرك باس دەكاتو دەفەرموێ:

(٤٨) بە بێگومان كە ﷲ هەرگیز خۆش ناوێ لەوەی كە شەریكی بۆ قەرار بدرێتولە تاوانی شرك هەرگیز چاوپۆشی ناكات مەگەر تەوبە بكات، وە لە خواری شیركەوە ﷲ لە گوناهەكانی تر خۆش دەبێت بۆ هەر كەسێك كە ئارەزوی لێ بێت ئەگەر تەوبەشی لەوتاوانە نەكردبێت، وە هەر كەسێك هاوبەش بۆ خوادابنێت بەراستی درۆو گوناهێكی گەورەی كردوە. جارێكیان پرسیار كرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ كە چ گوناهێك زۆر گەورەیە فەرمویٰ: {أَنْ تَجْعَلَ لِلهِ نِدا وُهُوَ خَلَقَكَ /متفق علیە/ ئەوەیكە هاوبەشی بۆ خوا دابنێیت لەحاڵێكدا كە ئەو دروستیكردوویت}

(٤٩) تۆ نابینی ئەو كەسانەی كە خۆیان بە باش دەزانن وەكو جوەكان كە دەیان وت: ئێمەگەلی هەڵبژێرراوی خوداین ( ن شعب ا اختار) نەخێر وانیە، بەڵكو هەرخوایە پاك دەكاتەوە ئەو كەسەی كە ئارەزۆی لێ بێتو هەرگیز بە ئەندازەی پلیتەیەك زوڵمیان لێ ناكرێت.

﴿فتیل﴾ دەزوە باریكەكەی ناو ئێسقانی خۆرمایە ئەگەر ئێسقانەكە بشكێنیت شتێكی باریكی لە ناو دایە واتە بەو ئەندازە كەمەیش ستەمتان لێ ناكرێت. تێبینی: لێرەدا پێم خۆشە ئەم قسە بكەم كەبۆشوێنەكانی تر بیانزانن، لە قورئاندا سێ وشە باس كراوە ﴿فتیل، فطم ، نق ﴾ هەرسێكەیان لە ناوی خۆرمادان (فەتیل) ئەو دەزوە باریكەیە كە لە ناو خورمادایە ئەبێتە مایەی سەوز بوون. (فطم ) بریتیە لەو تیكوڵە تەنكەی كە پێچراوە لە ناوكەی خورما. (نق ) بریتیە لەو چاڵەی كە وەكو ناوكی مرۆڤە كە لە ناوەراستی پێشەكەدایە. جا والله اعلم ئەگەر بێتو خورمایەك لەت بكەیتو بە جوانی دیقەتی لێ بكەی شێوە جەنازەی مرۆڤێكی مردوی ناو قەبر پێشان دەدات پێغەمبەر ﷺ جارێكیان فەرموی درەختێك هەیە ئەو درەختە زۆر لە مرۆڤ دەچێت كێ دەزانێ چیە؟ یارەكان هەریەكەو شتێكیان وت هیچ كەس نەی زانی بەڵام عەبدوڵای كوڕی عومەر لەوێ ئامادە بو كە تەمەنی منالێ بو وتی: ویستم بڵێم خورمایە بەڵام شەرمم كرد لەم هەمو پیاوە گەورانە كە لە وێ بون دوایی كە هەڵسان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: خورمایە وتم من ئەمزانی. عومەر وتی: زۆرم پێخۆش دەبوو كەبت گوتایە. بە گوێرەی ئەو فەرمودەیەش دەنكی خۆرما زۆر لە مرۆڤێكی مردوو دەچێت جا ئێمە هەر ئەو دەنكە رەقەی خورما دەنێژین پاشان دەبینین چۆن سەوز دەبێتو چەند بەرز دەبێت، ئێمەش كە خراینە ناو قەبرەوە پێچراوین بەو كفنەوە هەر ئاوەها خوا زیندومان دەكاتەوە ئەگەر بەهەشتی بین باڵامان شەست مەترە لە حەوت مەترداو ئەوەش كە جەهەنەمی بێت هەر دانێكی بە ئەندازەی چیای ئوحودەو قایمی پێستەكەی سەدان مەترە جا وا تێ دەگەم باس كردنی ئەو سێ وشەیە ئەو دەرسە گەورەو گرنگەی تێدایە هەر خوایش دەزانێ.

(٥٠) تەماشاكە كە ئەمانە چۆن بە دەمی خواوە درۆ هەڵدەبەستن؟ وە بەسە ئەم درۆیەی كە دەیكەن دانرێت بە گوناهێكی ئاشكرا بۆیان.

(٥١) ئایا تۆ نابینی ئەو کەسانەی کە بەشێك لە کتێبیان پێ دراوە کەچی چەواشە دەبن‌و باوڕ بە (**جبت و طاغوت**) دەکەن وەئەمانە دەڵێن بەوانەی کەوا کافرن ئا ئەمانە ڕێگایان چاکترە لەوانەی کە ئیمانیان هەیە. جا دەڵێن: کاتێك کە قورەیش جون پرسیاریان کرد لە جوەکان کە ئایا ئێمە راستین یان محمد ﷺ؟ وتیان: ئێوە راستن‌و ڕێگای ئێوە چاکترە لە پەیڕەوانی محمد ﷺ.

(٥٢) ئەوانە ئەو کەسانەن کە خوا نەفرینی لێ کردون، چونکە دژایەتی خواو پێغەمبەریان ﷺ کردوەو هەر کەسێکیش کە خوا نەفرینی لێ بکات ئیتر کێ هەیە یارمەتی بدات؟ واتە کەس یارمەتی نادات و ئەبێ سزای سەخت وسوتێنەر پاداشتی کردارو تاوانە پیسەکانی بێت. جولەکە پێیان وابو کە سەرپەرشتی ئایینی وکۆمەلایەتی ئەبێ لە دەست ئەواندا بێت‌و پێیان نەنگ وسەرشۆڕی بو ئەگەر پەیڕەوی پێغەمبەرێکی عەرەب بکەن‌و هەر خۆیان بە خاوەنی ئەو موڵکە دەزانی خواش دەفەرموێ:

(٥٣) ئایا بەشێك لەو موڵكە كە پێغەمبەرایەتیە هەیە بۆئەوان؟ ئەوسا ئەگەر بەشیان پێوەبوایە بە ئەندازەی ئەو چاڵە بچوکەی سەر ناوکی خورمایان بەکەس نەدەدا ئەوندە رژدو دنیا پەرەستن، جا چۆن دەبێ ئەوان بكرێن بە خاوەن موڵك؟ نەك هەر هیچ نابەخشن:

(٥٤) بەڵكوئەوان حەسادەت دەبەن بە خەڵك لە سەر ئەوەی كە ﷲ لە بەهرەو رەحمی خۆی بەشی داون، بەراستی ئێمە بە ئالی ئیبراهیم كە بە قسەی خۆیان ئەوان دوای ئیبراهیم كەوتون كتێب‌و ژیری‌و موڵكێكی گەورەشمان پێدان، جا ئەگەر ئەوان لە نەوەی ئیبراهیمن خۆ محمدیش ﷺ لە نەوەی ئیبراهیمە. جا بۆ بۆئەوان دەسەڵات‌و پێغەمبەرایەتی راستەو دروستەو بۆ محمد ﷺنادروست؟ بەراستی ئەم خۆ پەسەندی‌و لە خۆباییبونە هەر لە جولەكەو بێباوەران دەوەشێتەوە. مەبەست لەخەڵك لێرەدا پێغەمبەرە ﷺ چونكە هەرچی ئەخلاقی پاك‌و رەوشتی جوان هەبێت لە مرۆڤەكاندا لەودا كۆبوەتەوە هەر خۆی بە تەنیا «**الناس/خەڵكە**» وەكو چۆن ﷲ لەبارەی ئیبراهیمەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ /النحل: ١٢٠/ ئەو یەك ئۆممەتی گەردن كەچ بووە بۆ ﷲ ﴾ لێرەش پێغەمبەری ئاخر زەمانی بە هەمو خەڵك داناوە.

(٥٥) جا هەندێك لەو كاتەدا ئیمانیان بەو هێناوە هەندێكیشیان بەرگری خەڵكیان كردوە لە باوەڕ هێنان واتە ئەوان بۆ ئیبراهیم ئاوایان كرد ئەی بۆ تۆ چی دەكەن ئەی محمدﷺ؟ دەگونجێت

أُولَٰئِكَ الَّذِينَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ اللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُ نَصِيرًا (٥٢) أَمْ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّنَ الْمُلْكِ فَإِذًا لَّا يُؤْتُونَ النَّاسَ نَقِيرًا (٥٣) أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَىٰ مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ ۖ فَقَدْ آتَيْنَا آلَ إِبْرَاهِيمَ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَآتَيْنَاهُم مُّلْكًا عَظِيمًا (٥٤) فَمِنْهُم مَّنْ آمَنَ بِهِ وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ ۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا (٥٥) إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَاهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا الْعَذَابَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا (٥٦) وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۖ لَّهُمْ فِيهَا أَزْوَاجٌ مُّطَهَّرَةٌ ۖ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا (٥٧) ۞ إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ ۚ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا (٥٨) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٥٩)

ماناكەی بەم شێوەیەش بێت ئا ئەوانە هەندێكیان باوەڕیان هێنا بەمەی كە بۆ محمد ﷺ هات بوو وەكو عەبدوڵا ی كوڕی سەلام، وە هەندێكیشیان خەڵكیان مەنع دەكردو نەیان دەهێڵا خەڵك ئیمان بهێنێت، بەڵام ﷲ دەفەرموێ: بەسە جەهەننەم ئەو ئاگرە بڵێسە دارە بۆ ئەو تاوانبارانەی كە دژایەتی رێبازی پێغەمبەریان ﷺ كرد كە رێبازی ئیبراهیمە ؑ. ئینجا باسی پاداشتی باوەڕدارو سزای بێباوەڕ دەكات‌و دەفەرموێ:

(٥٦) بە بێگومان ئەوكەسانەی كە كافرن بە نیشانەكانی ئێمە بەم زوانە ئێمە دەیان خەینە ناو ئاگرێكی سوتێنەرەوە جا هەر كاتێك ئەو پێستە قایمەیان كوڵا - كە لە هەركاتژمرێكدا سەدو بیست جار دەتوێتەوە - پێستێكی تریان بۆ دروست دەكەین تا سزای تەواوی ئێشە ناپەسەندەكانی خۆیان بچەژن، بە بێگومان كەﷲ خاوەن هێزەو دانایە. واتە ئەم سزا گرانەتان بە لاوە سەیر نەبێت چونكە ﷲ خاوەنی هێزەو هەرچی ئارەزۆ بكات دەیكات‌و هیچ شتێك ناتوانێت رێگای بگرێت‌و هەروەها دانایەو دەزانی چۆن تاوان بن بڕ بكات. وە لەم ئایەتە پیرۆزەوە دەردەكەوێت كە پێست هەستی ئێش‌و ئازار دەكات جا ئەگەر زانستی مرۆڤ تازە ئەمەی زانیبێت خۆ قورئان چواردە چەرخ لە مەو بەر بە خەڵكی وتوە، جا فەرمون بۆبیستنی پاداشتی چاكە كاران كە دەفەرموێ:

(٥٧) بەراستی ئەوكەسانەی كە ئیمانیان بوە و كرداری چاكیان كردوە بەم زوانە دەیان خەینە ناو بەهەشتانێكەوە كە لە ژێر ئەو

أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾

بەهەشتانەدا چەندین جۆگە دەڕوات کەهەمیشە تێیدا دەمێننەوە، بۆ ئەوان لەو شوێنانەدا چەندین هاوسەری پاك وخاوێن هەیە کە نە عوزری ژنانەیان هەیەو نە نەخۆش دەکەون ونەهیچ خراپیان هەیەو دەیان خەینە ناو سێبەرێکی زۆر درێژەوە. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إن في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام لا يقطعها /منفق علية/ بێگومان درختی وا هەیە لە بەهەشت دا کە سەد ساڵ سوار بە ژێر سێبەری ئەو درەختەدا بڕوات ناگاتە ئەو سەری}. وەك دەفەرموێ: ﴿ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴾ الواقعە: ٣٠ / وە سێبەرێکی زۆر درێژ﴾.. ئینجا حوکمێکی ترمان بۆ باس دەکات، هۆی دابەزینی ئەو حوکمەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا کاتێك کە فەتحی مەکە کرا چوە ناو مەکەوە داوای کلیلی کرد لە عوسمانی کوری تەلحە کە کلیلی کەعبەی پێ بو لێی وەرگرت، چوە ناو کەعبەوە کە هاتە دەرەوە عەباس یان عەلی داوای لێ کرد کە کلیلەکەی پێ بدات تا کلیلی کەعبەیش هەر بە دەست ئەوانەوە بێت وەکو چۆن ئاو دانی حاجی بە دەست ئەوانەوە بو، ئینجا جبرەئیل هاتو وتی: کلیلەکە بدەنەوە بە عوسمان پێغەمبەریش ﷺ بانگی عوسمانی کردو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوەو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ ٱلْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا .. ﴾ کلیلەکەیشی دایەوە بە عوسمان.

﴿٥٨﴾ بەراستی خوا ئەمرتان پێ دەکات کە ئەمانەتەکان بدەنە دەست خاوەنی خۆیان، وە ئەمە بڕیارێکی گشتیە پێویستە هەر کەسێك ئەمانەتێکی لابو بیداتەوە بە خاوەنەکەی موسڵمان بێت یان کافر دەوڵەمەند بێت یان فەقیر، پیاو بێت یان ئافرەت، چاك بێت یان خراپ، ئینجا سەبارەت بە حوکمی حاکمان دەفەرموێ: هەر کاتێك حوکمتان کرد لە نێوان خەڵکا پێویستە بە داد پەروەرانە حوکم بکەن بە بێگومان کەالله بە باشترین شت ئێوە ئاموژگاری دەکات بەراستی خوای داناو میهرەبان هەمیشە بۆ ئیشو بەرنامەی چاك ئاموژگاریمان دەکاتو بەهەر شتێك کە فەرمانی کردوە بە سودمانە ئەنجام دانیو هەر شتێکیش کەقەدەغەی کردوە لێمان لە هەردوو ژیان دا زیانێکی گەورە دەکەین ئەگەر سنور ببەزێنینو ئەو کارە ئەنجام بدەین، وە هەر فەرمانڕەوایەکیش دادگەر بێت لە ڕۆژی قیامەتدا لە ژێر سێبەری عەرشدایەو خوایش یارمەتی دەدات. بە بێگومان کە الله بیسەرەو هەمو شتێك دەبیسێ چ بە دەنگی زۆر گەورە بێت چ بە چپەو زۆر هێواشبێ، وەبینەرەو هەمو شتێك دەبینێ لە گەورەو بچوك. ئینجا پاش ئەوەی کە فەرموی حاکمان دەبێ دادپەروەر بن، باسی فەرمان بە سەرا دراوانیش دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٥٩﴾ ئەی خاوەن باوەڕان گوێڕایەڵی خوا بکەنوگوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ بکەن و ئەوانەش کە خاوەنی ئەمرن لە ناو خۆتاندا، گوێ ڕایەڵی ئەوانیش بکەن. لێرەدا وشەی ﴿اطاعة﴾ ی بۆ خواو پێغەمبەر ﷺ باس کرد بەڵام لە ﴿وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ﴾ دا دوبارەی نەکردەوە تا بزانین کە فەرمانداریك پێویستە بە گوێیان بکرێت کە فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ بە سەر خەڵکدا بدات ئەگینا ئەگەر فەرمانەکانی دژی فەرمانی خواو پێغەمبەر ﷺ بو نا بێ بەگوێ بکرێت بەڵکو دەبێ گەل ئەو فەرماندەیە لابات مادام خراپەیەکی گەورەتر لە تاوانەکەی ئەو روونەدات وەکو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {السمع والطاعة على المرء المسلم فيما أحب وكره ما لم يؤمر بمعصية فإذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة /منفق علية/ گوێ گرتنو پەیڕەوی کردن پێویستە لە سەر هەمو پیاوێکی موسڵمان لەو شتەی کە پێی خۆشەو لەوەش کەپێی ناخۆشە مادام فەرمانی تاوانی پێ نەدرا جا ئەگەر فەرمانی تاوانی بە سەرا درا نەگوێ گرتن هەیەو نە پەیڕەوی کردن} وشەی ﴿مِنكُمْ/ لە خۆتان﴾ تێمان دەگەیەنێت کە ئەو کەسەی کە سەپەرشتی موسڵمانان دەکات پێویستە لە خۆیان بێت واتە ئەویش موسڵمان بێت، پاشان دەفەرموێ: وە ئەگەر لە بارەی هەر شتێکەو ناڕێکیتان بو دەبێ ڕوکەنەوە خواو پێغەمبەر ﷺ کە قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەرە ﷺ ئەگەر باوەڕتان بە خواو بە

ڕۆژی دوای هەیە واتە ڕێگە نیە بۆ هیچ خاوەن باوەڕێك کە ناکۆکیەکانی خۆی بە ڕێبازو فەرمانی بێجگە لە خواو لە پێغەمبەر چارەسەر بکات جا هەر ناڕێکیەك لە نێوان دوو موسڵماندا ڕوی داو یەکێکیان وتی: با بچینە لای شەرعو ئەویتریان وتی: شەرعم پێ قبوڵ نیە با بچینە لای یاسا، بێگومان دووهەمیان کافر دەبێت وەکو لە ئایەتی شەستوپێنجی هەمان سورەت دا دێت. بۆیە دەفەرموێ: هەر ئەمە چاکەو جوانترین شتە بۆ ئایندە هەم بۆ دنیاو هەم بۆ پاشەرۆژ. ئینجا الله جوانتر ئەم دوو کەسە لە یەکتر جیا دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٦٠) ئایا تۆ نابینیت ئەو کەسانەی کەوا گومان دەکەن کەباوەڕیان هەیە بەوەی کە ڕەوانە کراوەتەوە لای تۆو باوەڕیان هەیە بەوەی کە پێش تۆ ڕەوانە کراون بەڵام لەهەمان کاتدا دەیانەوێت حوکمی خۆیان ببەنە لای تاغوت لەحاڵێکدا کەئەوان دەستوریان پێ دراوە کە دەبێ کافر ببن بە تاغوت. ئەوە بو لە سورەتی بەقرە ئایەتی دووسەدوپەنجاوشەشدا فەرموی: ﴿ئەوسا هەرکەسێك کە باوەڕی نەبێ بە تاغوتو ئیمانی ببێ بە الله ئەوە بەراستی دەستی گرتوە بە پەتی زۆر موحکەمەوەو بچڕانی بۆ نیە﴾ بەڵام ئەمانە بە پێچەوانەی ئەو ئایەتە ڕەفتار دەکەن، ئینجا خوا دەفەرموێ: ئەوسا شەیتان دەیەوێت ئەوان گومڕاه بکات بە گومڕاهییەکی دوور لە حەق. هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە بەم شێوەیە کە گوایە کابرایەکی یارمەتی دەرو جولەکەیەك بو بە کێشەیان کابرای جولەکە وتی با لە نێوان منو تۆدا محمدﷺ بڕیار بدات کابرای موسڵمان وتی: نەخێر کەعبی کوڕی ئەشرەف. هەروەها بێژراوە کە سەبارەت بە کۆمەڵێك موناڤق کە بە ڕواڵەت خۆیان بە موسڵمان پێشان دەداو ویستیان کە بچنە لای حاکمە نەفامەکان بۆ یەکلا کردنەوەی ئیشەکانیان، بێجگە لە مانەش قسەی تر کراوە سەبارەت بە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە، بەڵام ئەم ئایەتە بۆ گشتیەو لۆمەو سەرزەنشت کەری هەر کەسێکە کەلە کتێبی خواو لە سوننەتی پێغەمبەرﷺ لابداتو بچێت بۆ پەیڕەوی کردنی بێجگە لەوان، ئینجا اللهدوو ڕووەکانمان بۆ باس دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٦١) هەر کاتێك بەئەوان بوترێت وەرن با بچین بۆ لای ئەوەی کە خوا ناردویەتیو بۆ لای پێغەمبەرﷺ و باوەڕی پێ بهێننو هەر ئەویش لە نێوانماندا بڕیار بدات، ئەی محمد ﷺ تۆ دەبینی کە دووڕووەکان چۆن پشتت تێدەکەن بەپشت تێکردن.

(٦٢) ئەوە چۆنە هەر کاتێ کە ئەوان بەڵاو موسیبەتێکیان توش دێت بە بۆنەی ئیشی ناپەسەندی خۆیانەوە لە پاشان دێنە لاتو سوێند دەخۆن بە خواو دەڵێن: بەخوا ئێمە پیاوی چاکینو مەبەستی خراپەمان هەرگیز نەبوەو هەر ویستومانە چاکە بکەینو ڕێگای ڕاست ودروست بگرینو کێشەکان چارەسەر بکەین؟ بەڵێ ئەو کاتە ئاوەها بەزمانی لوس قسەی قەڵەوو زل دەکەنو پاکانە بۆ ئیشە ناپەسەندەکانیان دەکەن، بەڵام الله بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ:

(٦٣) ئەوانە کەسانێکن کەالله دەزانێت چیان لە ناو دڵدایە جاپشتیان تێ بکەو گوێ بە قسەکانیان مەدەو ئارەزۆی تۆڵە سەندنەوە مەکە بەڵکو دەبێ تۆ دڵ فرەوان بیت و ئامۆژگاریان بکەو قسەیەکی جوانی وایان لە گەڵدا بکە کە کاریان تێ بکات، بەڵکو پەشیمان ببنەوەو بێنەوە سەر ڕێبازی خوا ناسان.

(٦٤) خۆ ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە مەگەر بۆ ئەوە بێ کە پەیڕەوی بکرێت بە ئیزنی خوا، وە ئەگەر ئەوان ئەوکاتەی کە زیانیان بە خۆیان گەیاندو ستەمیان لە خۆیان کرد لەو کاتەدا بهاتنایە لای تۆ، جا داوای لێخۆشبونیان بکردایە لە خواو پێغەمبەریش داوای لێخۆشبونی بۆ کردنایە ئەو کاتە دەیان دی کە خوا خوایەکی تەوبە قەبوڵکەرو بە ڕەحمەو تەوبەی لێ وەردەگرتن. دیارە ئیتاعەی پێغەمبەران بۆیە ڕەوایە چونکە بە ئیزنی خوایە ئەگینا نابێ ئیتاعەی هیچ کەسێك بکرێت چونکە ئەگەر مرۆڤ ئیتاعەی هەر شتو هەر کەسێکی کرد مادام بە فەرمانی خوا نەبێت ئەو کەسە ئەگەر باوەڕ دار بێت دەبێ بە موشریك وە ئەگەر باوەڕداریش نەبێت کافرە کە جێگای هەردووکیان ئەگەر بەر لەمردن تەوبە نەکەن جەهەننەمە، ئینجا هەر کەسێك ئەگەر گوناهی کردو پێغەمبەریشﷺ دوعای بۆ کرد ئیتر اللهلە گوناهەکانی خۆش دەبێت. جا موژدە بێت لە خاوەن باوەڕان کە پێغەمبەرﷺ بە فەرمانی خوا دوعای کردوە چونکە خوا فەرمویەتی: ﴿ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ ﴾ محمد: ١٩ / داوای لێ خۆشبون بکە بۆخۆتو بۆ هەمو باوەڕداران﴾. ئاشکرایە کە پێغەمبەرﷺ فەرمانی خوای بە تەواوی ئەنجام داوە، جا ئەگەر ئەمڕۆ لە ژیاندا نیە خۆ دوعای بۆ کردوین جا مادەم تەوبە بکەین خوای گەورەو میهرەبان لێمان خۆش دەبێت، جا با دووڕوو بێباوەڕانیش ئەم هەلە لەدەست خۆیان نەدەن تا لە دنیا دەر نەچوون پەشیمان ببنەوەو ڕێگای پێغەمبەرﷺ بگرنو تەوبە بکەن، خوا، خوای هەمومانەو ئەم ئاینە بۆ هەمو خەڵکە هەتا قیامەت بە بێ جیاوازی، ئینجا بە ڕاستو ڕونی خوا پێشانمان دەدات کە کێ موسڵمانەو کێ کافرەو کەس ناتوانێ خۆی بشارێتەوەو هەرچی بکات، هەرچی بڵێت موسڵمانم، جا پێش ئەوەی کە ئەم ئایەتە باس بکەین بۆ چاکتر ڕۆشن بونەوەی ماناکەی هۆی دابەزینی ئایەتەکە باس دەکەین کەئیمامی بۆخاری

وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ ٱقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ أَوِ ٱخْرُجُوا۟ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا۟ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّءَاتَيْنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّۦنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُو۟لَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ خُذُوا۟ حِذْرَكُمْ فَٱنفِرُوا۟ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُوا۟ جَمِيعًا ﴿٧١﴾ وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا ﴿٧٢﴾ وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧٣﴾ ۞ فَلْيُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا بِٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٧٤﴾

له عوروەی كوری زوبەیرەوە دەیگێڕنەوە كە پیاوێك: لەگەل زوبەیردا له سەر ئاوی چەمێك بوو بە كێشەیان كە باخی زوبەیر پێش باخی كابرا بووپێغەمبەرﷺ فەرموی: {إِسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ أَرْسِلْ الْمَاءَ إِلَى جَارِكَ فَغَضِبَ الْأَنصَارِي فَقَالَ أَنْ كَانَ ابْنَ عَمَّتِكَ فَتَلَوَّنَ وَجْهُ رَسُولِ اللهِ ﷺ ثُمَّ قَالَ اسْقِ يَا زُبَيْرُ ثُمَّ احْبِسْ الْمَاءَ حَتَّى يَرْجِعَ إِلَى الْجَدْرِ فَقَالَ الزُّبَيْرُ وَاللهِ إِنِّي لَأَحْسِبُ هَذِهِ الْآيَةَ نَزَلَتْ فِي ذَلِكَ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ /پێغەمبەری خواﷺ فەرموی ئەی زوبەیر باخەكەت ئاو بدەوپاشان ڕەوانەی بكە بۆ هاوسێكەت كابرای یارمەتی دەر توڕەبوو وتی: له بەر ئەوەی كە پوور زاتە بۆیە وای بۆ ئەكەیت؟ ڕومەتی پێغەمبەری خواﷺ گۆڕاو فەرموی: ئەی زوبەیر گۆلەكانی خۆت تەواو پڕ بكە ئینجا ڕەوانەی بكە بۆ هاوسێكەت بەم شێوەیە ڕك وڕاست مافی تەواوی دا بە زوبەیر كاتێ كە كابرا ڕقی پێغەمبەریﷺ هەستان، له پێشەوە سوڵحی كردنو ڕێگایەكی بۆ دانان كە بۆ هەردووكیان فرەوانی تێدا بوو كە پیاوەتی له گەل یەكتردا بكەن یان زوبەیر زووتر ڕەوانەی بكردایە یان ئەو كەمێ چاوپۆشی له زوبەیر بكردایە بەلآم وا ئێستا حوكمەو دەبێ هەردوو بەو شێوەیە ڕەفتار بكەن. زوبەیر دەڵێت: من وا دەزانم كە ئەم ئایەتە لەو بارەوە دابەزیوە﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ... ﴾ } له پێشەوە باسمان كرد كە هەندێك ئیدعای باوەڕ بە خواو بەوەی كە ڕەوانەی كردوە هەبو بەلآم كاتێ بیانویستایە بڕیارێكیان بۆ بدرێت بەرەو تاغوت دەڕۆیشتن، خوا لەوێدا ئەو ڕێگەی بە ڕێگەی شەیتان داناو فەرموی: شەیتان دەیەوێت له ڕێگای ڕاست لایان بدات لێرەدا ڕۆشنترو توندتر دەفەرموێ:

﴿٦٥﴾ وانیە كەئەوان دەزانن، سوێند بە خوای تۆ ئەی محمدﷺ ئەوانە باوەڕیان نییە هەتا تۆ نەكەن بە حەكەم له هەمو شتێكدا كە ڕودەدات له بەینیانداو له پاش حوكمەكەی تۆ هەر ئەوەش بەس نیە كە بە دەم بڵێن ڕازین بەڵكو دەبێ بە دڵو بە گیان بەو بڕیارەی تۆ ڕازی ببن كەواتە نابێ له ناو دڵیاندا هیچ ناڕەحەتیەك هەبێت ئەگەر بە سودی نەبو، واتە ئەگەر له ناو دڵیشیاندا نارازی بون بەو حوكمە كە كرا مانای وایە ئیمانیان نیەو درۆ دەكەن، نەك هەر ئاوەهاش بەڵكو دەبێ بە هەمو شێوەیەكیش گەردن كەچی خۆیان بەرامبەر بەو حوكمە پێشان بدەن و خۆیان تەسلیم بكەن. بەڵێ پێویستە مرۆڤی خاوەن باوەڕ له دڵەوە خۆشحاڵ بە بە فەرمانەكانی خواو پێغەمبەرﷺ دەرببڕێتو پێی ڕازی بێت، چونكە هەموی بۆ سودی مرۆڤەو هیچ سودێك یان زیانێك له كردنو نەكردنیدا بە خوا ناگات.

﴿٦٦﴾ ئەگەر ئێمە پێویستمان بكردایە له سەر ئەوان كە خۆیان بكوژن یان دەبێ له ماڵكانتاندا دەربچن نەیان دەكرد مەگەر كۆمەڵێكی كەمیان نەبێت جا ئەگەر ئەوان ئەوەی كە ئامۆژگاریان پێ كرا بیانكردایە بەڕاستی ئەوە شتێكی زۆر باش بو بۆ یانو ئەوە دەبو بە هۆی بتەوتر بونی ئەوان له سەر ڕێبازی خوا. واتە ئەگەر بمان وتایە كە دەبێ خۆتان بكوژن ئەگینا تەوبەتان لێ قەبوڵ ناكەین، وەدەبێ له ناو ماڵو خێزانی خۆتان كۆچ بكەنو دەربچن بۆ وڵاتێكی تر، چونكە گوناهتان كردوە ئەگینا تەوبەتان لێ قەبوڵ ناكەین ئەنجامتان نەدەدا مەگەر كۆمەڵێكی كەمتان. كەوابو شوكری خوا بكەن كە ئەو بارەی سوك كردوە له سەر ئێوەو تەنها بە تەوبە كردنو پاڕانەوەی پێغەمبەرﷺ بۆتان ﷲ تەوبەتان لێ قەبوڵ دەكات. جا لەم دوو ئایەتەوە بەچاكی دەركەوت كە حاكمیەتی غەیری خوا نا بێ قەبووڵ بكەین و فەرمانی پێغەمبەریش ﷺ هەر فەرمانی خوایەو فەرمانی كەسی تر نا بێ قەبوڵ بكرێت مەگەر فەرمانەكەی فەرمانی خواو پێغەمبەر بێت، وە دەبێ فەرمان بە سەرا دراو بە دڵو بە گیانو بە ماڵ ئامادەی ئەنجام دانی ئەو فەرمانانەی خواو پێغەمبەر بێت ئەگینا له سنوری باوەڕ دار دەردەچێت با ریشەكەی مەترێك پان بێتو مێزەرەكەی له بەفر سپی تربێت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ لَا يَنْظُرُ إِلَى أَجْسَادِكُمْ وَلَا إِلَى صُوَرِكُمْ وَلَكِنْ يَنْظُرُ إِلَى قُلُوبِكُمْ وَأَشَارَ بِأَصَابِعِهِ إِلَى صَدْرِهِ /مسلم وغ ه/بەڕاستی خوا تەماشای لەشو وێنەتان ناكات بەلآم تەماشای دڵەكانتان دەكات،

وەبەپەنجەی هیمای کرد بۆسینگی کەجێگای دڵە} جا ئەوەی کە بە گوێ خوای کرد دەفەرموێ:

(٦٧) وە ئەوکاتە لە لایەنی خۆمانەوە پاداشتێکی زۆر گەورەمان پێدەدان.

(٦٨) وە بە دڵنیاییەوە ئەوانمان ڕێنمایی دەکرد بۆ ڕێگای ڕاست.

بەڵێ ئەو هەمو چاکە گەورانە کاتێك دەبێ کە ئێمە خۆمان پیاو بین‌و مەردانە بمانەوێ کە پەیڕەوی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ بکەین چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿وە ئەوانەی کە کۆشش دەکەن لە بەر خاتری ئێمە با دڵنیا بن کە ئێمە ڕێنماییان دەکەین بۆهەمو بەشەکانی ئایین، وە بە بێگومان کە ﷲ لە گەڵ چاکە کاراندایە﴾ عەنکبوت: ٦٩. ئینجا خوا مۆژدەیەکی خۆش بۆ موسڵمانان باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٦٩) جا ئەو کەسەی کە پەیڕەوی خواو ئەم پێغەمبەرەی بکات ئەوسا ئەوە لەگەل ئەو کەسانەدا دەبێ کە خوا نیعمەتی ڕژاندوە بە سەریاندا کە پێغەمبەران‌و ڕاستگۆیان‌و شەهیدان‌و پیاو چاکانن، ئای چ ڕەفیقێکی چاکن ئەوانە. هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بو کە جارێکیان پێغەمبەری خواﷺ یەکێ لە یارەکانی دی کە عاجز بو فەرموی: بۆ عاجزی؟ وتی: خەیاڵێکەو هاتوە بە ناو دڵمدا لە بەر ئەوە عاجزم فەرموی: چیە؟ وتی: کەبیرم کردەوە ئێمە هەمو ڕۆژێك بەیانی‌و ئێوارە دێین بۆ لای تۆو بەهرەیەکی گەورە ئەبەین لە بینین‌و دانیشتن لە خزمەتتاو وەقرەناگرم کەرۆژێك نەتبینم، بەیانی تۆ بەرز ئەبیتەوە لە گەل پێغەمبەراناو ئێمە پێت ناگەین لە بەر ئەوە نارەحەتم کە ئەو ڕۆژە هاتە پێشەوە ئێمە تۆ نابینین پێغەمبەری خواﷺ بێ دەنگ بوو جبرەئیل دابەزی‌و ئەم ئایەتەی بۆ هێنا، جا پێغەمبەرﷺ ناردی بە شوێنیاو ئەم مۆژدە خۆشەی دایە.

﴿الصدیق﴾ بە کەسێك دەڵێن کە باوەڕی بە پێغەمبەرو پەیامەکەی هەبێت لە دڵەوەو هیچ بەلگەی نەوێت‌و بەراستی بزانێت. ﴿الشهید﴾ بەو کەسە دەڵێن کە گیانی خۆ فیدای خوا بکات. ﴿الصالح﴾ بە کەسێ دەڵێن کە لە ناو دڵیدا بێجگە لە چاکە کاری شتێکی تر نەبێت و لە کرداری خراپ لەش‌و دڵی خۆی بپارێزێت. جا کەسێکیش کە لە بەر خوا ئەوانی خۆش بوێ بەو پلانە دەگات‌و پەروەردگاریش میهرەبانی خۆی بەوان دەگەیەنێت.

لە فەرمودەی سەحیح دا هاتوە کە دەفەرموێ: {الْمرءُ مَعَ مَن أَحَبَّ /الترمذي، صححه الالبا / مرۆڤ لە گەڵ ئەو کەسەدا دەبێت کە خۆشی دەوێت}.

(٧٠) ئەمە زیادە ڕێزێکە لە لایەنی خواوەو بە کردەوەی کابرا نیە چونکە هیچ کەس شایستەی ئەوە نیەکە بگاتە پلەی پێغەمبەرﷺ و زانینی خوا بەسە بۆ زانینی ڕاستی‌و ناراستی ناو دەرونی خەڵك‌و چاك دەزانێت کێ بەراستی پێغەمبەری خۆش دەوێت‌و کێش هەر بە دەمەو بە دڵ جۆرێکی ترە.

ئینجا ﷲ موسڵمانان وریا دەکاتەوە بەرامبەر بە مەترسییەکانی دنیایی‌و دەفەرموێ:

(٧١) ئەی ئیمانداران هەمیشە ئامادە باش‌و وریا بن بەرامبەر بە دوژمنانتان جا هەمیشە کۆمەڵ کۆمەڵ دەرچن بۆ دینەکەی خواو بۆ جیهاد کردن لە ڕێگای خوادا یان هەر هەموتان دەربچن. واتە ئەگەر بە کۆمەڵ کۆمەڵ بەس بو بەسە، ئەگەر بە کۆمەڵ کۆمەڵ بەس نەبو دەبێ هەموتان دەرچن بۆ جیهاد لە ڕێگای خوادا، ئینجا لەوەش وریامان دەکاتەوە کە هەندێ کەس لە سەرەتاوە لە گەڵ موسڵمانانن، بەڵام لە کاتی تەنگانەدا خۆیان دەکێشنەوە واتە لە دەروندا لە گەڵ موسڵماندا نین، بەڵام لە ڕواڵەتا خۆیان وا پێشان دەدەن کە لە گەڵ موسڵمانان دان هەتا کاتی نارەحەتی، ئینجا ئەگەر ئەو کاتە تووشی نیعمەتێك بون داخ‌و خەفەتی زۆر ئەخوات بۆ ئەویش نەبوە ، وە ئەگەر تووشی ناخۆشیش بون دەڵێن چاك بو لە گەڵیاندا نەبوین ، ئەوەتە ﷲ ئەو باسەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو نیەت‌و ڕەفتارو کرداری هەل پەرست‌و دوو ڕوە کانمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٧٢) بێشك کەلە ناو ئێوەدا کەسانێك هەن کە سستی دەکەن‌وخۆیان دەشارنەوە لە جیهاد جا ئەگەر ئێوە دوچاری بەلاو موسیبەتێك هاتن دەڵێت: بەراستی خوای گەورە نیعمەتی بەسەرمدا ڕژاندو منی خۆشبەخت کرد کە لە گەل ئەوانەدا نەبوم کە تووشی ئەو بەلایە ببم.

(٧٣) خۆ ئەگەر هات‌و خوا دوچاری چاکەیەکی کردن‌و نیعمەتێکی خۆی دابە ئێوە وسەرکەوتن‌و دەسکەوتێکی دنیاییتان دەستکەوت ئەو کاتە وەك ئەوەی کە هیچ دۆستایەتیەك نەبێت لە بەینی ئێوەو ئەودا دەڵێت: ئای خۆزگە منیش لە گەڵ ئەواندا بومایە جا منیش ئا ئەو بەهرە گەورەیەم دەست بکەوتایە. بەڵێ بێ باوەڕان‌و دووڕووەکان‌و ئەوانەی کە لەجیهاد خۆیان دەشارنەوە هەر سودو بەهرەی دنیا لە بەر چاو دەگرن. ئینجا باسی جیهاد دەکات‌و دەفەرموێ:

(٧٤) با شەڕ بکەن لە ڕێگای خوادا ئەوانەی کە ژیانی دنیایان دەفرۆشن بە قیامەت، وە ئەو کەسەی کە شەڕ بکات لە ڕێگای خوادا جا بکوژرێت یان سەر بکەوێت ئەوسا بەم زوانە پاداشتێکی

وَمَا لَكُمْ لَا تُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخْرِجْنَا مِنْ هَٰذِهِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهْلُهَا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا وَٱجْعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓاْ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُواْ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾

**گەورەی پێ دەدەین. جا ئەگەر کابرا نەکوژراو سەرکەوتو غەنیمەتی دەست کەوت با وا نەزانێ کە پاداشتی قیامەتی رۆیشتوە، نەخێر لە فەرمودەداهاتوەکە: {تَكَفَلَ اللهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلا الجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ وَتَصْدِيقُ كَلِمَاتِهِ بِأَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَةَ أَوْ يَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الذِي خَرَجَ مِنْهُ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ /متفق عليه/ خوا خۆی کردوە بە زامن بۆ هەر تێکۆشەرێك لە رێگای خۆیدا کە ئەگەر مراندی بیخاتە بەهەشتەوە یان بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێی دەرچوە لەگەڵ ئەوەی کە دەستی کەوتوە لە پاداشت یان لە دەستکەوت} بەم شێوەیە قورئان داوا لە خاوەن باوەڕان دەکات کە رژدی بە ماڵو بە گیانیان نەکەن، چونکە هەم ماڵەکەو هەم گیانەکە ئەمانەتی خوا خۆیەتی وهەتا خۆی ئیرادە نەکات کەس ناتوانێ لایان بات و ئەگەر ویستی لەناویان ببات کەس بۆی ناپارێزرێت، دووبارە هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە جیهاد دەخەنە پشت گوێو هەڵیان دەنێت بۆ جیهادو دەفەرموێ:**

**﴿٧٥﴾ ئەوە چیەو بۆ دەبێ شەڕ نەکەن لە رێگای خواداو لە رێگای رزگارکردنی چەوساوان لە پیاوانو ژنانو منالانێك کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان دەرمان بکە لەم شارەی کەگەورەو دەسەڵاتدارانی ستەمکارەو خوایە لە لایەن خۆتەوە دۆستێکمان بۆ بنێرەو لە لایەن خۆتەوە یارمەتی دەرێکمان بۆبنێرە؟! مەبەست پێی شاری مەکەیە (ابن عباس) کە ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەیوت منو دایکم لەوانە بوین. (قرية) بە گوندو شاریش دەوترێت ئەوەتە قورئان بە مەکە دەفەرموێ: (ام القرى) لەکاتێکدا مەکە لەو سەردەمەدا گەورەترین شاری ئەو دەورو بەرەبوە. ئینجا ﷻ زیاتر موسڵمانان هەڵدەنێو دەفەرموێ:**

**﴿٧٦﴾ ئەو کەسانەی کە ئیماندارن شەڕ لە رێگەی خوادا دەکەن بەڵام ئەوانەی کە کافرن شەڕ لە رێگەی طاغوتدا دکەن بۆ هێنانە دی ئاواتی ئەو تاغوتەوبەرزبونەوەی ، دەی سا شەڕ بکەن لە دژی دۆستەکانی شەیتانو مەترستن بە بێگومان کە فرو فێڵی شەیتان زەعیفو لاوازە. بەڵێ ئەم ئایەتە بناغەیەکی گەورەمان بۆ دیاری دەکات ئەوەش ئەوەیە کە هەرکەس کە بە بێزۆرەملی لە پێناوی تاغوتان دژ بە باوەڕداران شەڕ بکات ئەوە کافرە با خۆیشی بە باوەڕداربزانێت، کاتێك موسڵمانان لە سەرەتاوە لە شاری مەکە بون تەنها چەند شتێکی وەکو نوێژو دوری لە رەوشتی ناپەسەند پێویست کرابو لە سەریان ئێشو ئازاری زۆریان دەدی بەدەست موشریکانەوەو ئاواتیان دەخواست کە فەرمانی جیهادیان بۆبێت کە ئەو کاتەش نەگونجاو بو لە بەر چەند هۆیەك لە وانە کەمی موسڵمانانو زۆری دوژمنەکانیانو بونیان لەو شارە بەرێزە دا کە شەڕ لەو شارە دا شتێکی پەسەند نەبو، ئینجا کە هاتنە مەدینەو ژمارەیان زۆر بو جێگاو یارمەتی دەریان بۆ پەیدا بو خوا داوای لێکردن کە جیهاد بکەن کە چی لەو کاتە دا پێیان خوش نەبو وەك دەفەرموێ:**

**﴿٧٧﴾ ئەی محمد ﷺ ئایا تۆ نابینی ئەو کەسانەی کە پێیان وترا لە پێشەوە دەستی خوتان بگرنو شەڕنەکەن ونویژەکانتان بکەنو زەکات بدەن کە ئەو کاتە چونیەتی زەکاتیش دیاری نەکرابو، کە چی کاتێك کە فەرز کرا لە سەریان شەڕ بکەن ئالەو کاتەدا هەندێك لە وانە دەترسان لە خەڵك وەك چۆن دەترسان لە خوا یان زیاتر لە خواش لە وان دەترسان کەدەیان وت: ئەی پەروەردگارمان بۆ فەرزت کرد لە سەرمان شەڕ خۆزگە ماوەیەکی تر دوات بخستایە بۆمان خواش دەفەرموێ: پێیان بڵێ رابواردنو لەزەتەکانی دنیا شتێکی کەمنو ئاخیرەت باشە بۆ ئەو کەسەی کەتەقوای هەبێتو لە خوابترسێتو بە ئەندازەی دەزولە باریکەکەی ناودەنکی خورما ستمەمتان لێ ناکرێت. شتێکی رونە کە ئێوە لە ترسی مەرگە پێتان ناخۆشە شەڕ بکەن بەڵام بزان کە..**

**﴿٧٨﴾ لە هەر کوێیدا بن مەرگتان پێ دەگات ئەگەر چی ئێوە لە چەندین قەسری بتەوو بەهێزو سافکاری کراو بە گەچ دابن، وە ئەگەر توشی خۆشی ببن دەڵێن ئەمە لە لایەنی خواوەیە، خۆ ئەگەر توشی بەڵاو موسیبەت بون دەڵێن: ئەمە خەتای تۆیە ئەی**

محمدﷺ پێیان بڵێ: ئەمە هەمووی لە لایەنی خواوەیە، خۆشی وناخۆشی‌و گرانی‌و هەرزانی بە بێ ویستی خوا نابێت، هەرچەند کە مرۆڤ خۆیشی هۆی چاکی یان خراپی بێت، ئەوە چیە ئەو قەومە خەریکە نەزانن چۆن قسە دەکەن‌و دەرکیان نیە لە قسە کردنیاندا ونافامن چی دەڵێن.

(٧٩) ئەوەی کە دوچاری تۆ دێت ئەی محمدﷺ لە چاکە لە لایەنی خواوەیەو ئەوەی کە دوچارت دەبێت لە خراپە ئەوسا ئەوەیش هەرلە نەفسی خۆتەوەیە، بە بۆنەی لادانی خۆتە لە هەندێك شتی پێویست بۆیە توشی بەڵاو موسیبەت دەبی، وە ئێمە تۆمان رەوانە کردوە بۆلای خەڵك کە نێرراوی ئێمە بیت‌و پەیامی ئێمە بگەیەنیت بەوان، وە بەسە کە خوا شایەت بێت لە سەر گەیاندنی ئەوپەیامەو رەفتاری ئەوان لە گەڵ تۆدا. جا خوا ئەگەر بە پێغەمبەرﷺ بفەرموێ: ئەی محمدﷺ هەرچی تەنگو چەڵەمەت توش بێت تاوانی خۆتە ئەی ئێمەی ئیماندار چۆن دەبین کە بە هەزاران تاوانمان هەیە؟ خۆ ئەگەر توشی بچوکترین سزا ببین گورج ئاهو ناڵەی گلەییمان بە ئاسمان دەگات بەراستی هەر خوا چاکمان دەناسێت. ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا﴾ /الاحزاب: ٧٢/ بەراستی کە مرۆڤ ستەمکارەو بێ ئاوەزا﴾

(٨٠) ئەو کەسەی کە پەیرەوی ئەم پێغەمبەرەﷺ بکات ئەوسا بەراستی پەیرەوی خوای کردووە هەر کەسێك کە پشت بکاتە پێغەمبەرﷺ وگوێی پێ نەدات ئەوسا ئەی محمدﷺ ئێمە تۆمان نەناردوە کە حەرەس‌و چاودێری ئەوان بیت تۆ هەر گەیاندنت لە سەرەو بەس ئیتر ئەوان چی دەکەن لەتاوان‌و خراپەکاری ئێمە ئاگامان لێیانە. بۆ رۆشنکردنەوە ئەم مانایە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {مَنْ أَطَاعَنِي فَقَدْ أَطَاعَ اللهَ وَمَنْ عَصَانِي فَقَدْ عَصَى اللهَ وَمَنْ أَطَاعَ أَمِيرِي فَقَدْ أَطَاعَنِي وَمَنْ عَصَى أَمِيرِي فَقَدْ عَصَانِي /متفق عليه/ هەر کەسێك پەیرەوی من بکات پەیرەوی خوای کردووە هەر کەسێکیش سەرپێچیم بکات سەر پێچی لە فەرمانی خوا کردوە، وە هەر کەسێك پەیرەوی ئەمیری خۆی بکات بەراستی پەیرەوی لە من کردوە، وە هەر کەسێکیش سەر پێچی بکات بەراستی سەر پێچی لە فەرمانی من کردوە} ئێنجا هەندێ لە نهێنیەکانی دوو رووەکان باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٨١) لە لای تۆ دەڵێن: بە گوێت دەکەین، جا کاتێك کە دەرچون لە لای تۆ شەو دادەنیشن‌و بڕیارێك دەدەن‌و شتێك دەڵێن نەئەوەی کە بە تۆیان وتوە، وە خوا دەینوسێت ئەوەی کە ئەوان بە شەو دەیڵێن‌و دەیکەن سا پشتیان تێ بکەو گوێیان پێ مەدەو بە حەوسەڵە بەو پشت ببەستە بە اللهﷻ لە فڕو فێڵەکانیان‌و لەو باس‌و

مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ﴿٨٠﴾ وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُوا۟ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ ۖ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ ۖ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٨١﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ ۚ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُوا۟ فِيهِ ٱخْتِلَٰفًا كَثِيرًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُوا۟ بِهِۦ ۖ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ۗ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾ فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ مَّن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾

دانیشتنەی کە شەوان دادەنیشن‌و بیری لێ دەکەنەوە بەرامبەرت، سا بەسە کە خوا پشتیوان بێت. ئینجا خوای دانا وا لە بەندەکانی دەکات کە بیر لە قورئان بکەنەوەو فێری وشەو ماناکانی ببن‌و تەماشا بکەن‌و بزانن لەو قورئانەدا دژایەتی یەکتری دەبینن، چونکە پەیامێکی راستەو لە لایەنی زاتی حەقەوە هاتوەو دەفەرموێ:

(٨٢) ئایا ئەوان بیر ناکەنەوە لەو قورئانەی کە ئێمە بۆ تۆمان رەوانە کردوە ئەگەر ئەو کتێبە لە غەیری خواوە هاتبایە بێ شك زۆر نارێکی تێدا دەبو، وە زۆر قسەی دژی یەکتری تۆمار دەکرد دەی مادام دەبینن کە قسەیەکی رێك وپێکەو هەمووی لکاون بە یەکترەوە، دەبوایە خۆیان چاك بیانزانیایە کە ئەمە قسەی خوایە و تەسلیم بە قسەکانی تۆ ببونایە ئەی محمدﷺ بڵێ بەراستی ئەوەی کە زاناو پسپۆر بێت لە بارەی قورئانەوە چاك سەری بەندایەتی بۆ خوا دادەخات‌و دەڵێت: باوەڕمان بەوە هەیەو هەمووی لە لایەنی پەروەردگارمانەوە هاتوە. عەبدوڵا ی کوڕی عومەر (خوالێیان خۆشبێ) دەڵێت بەیانیەك زوو چومە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و ئێمە دانیشتبوین ناکۆکیەك کەوتە نێوان دوو کەسەوە لە بارەی ئایەتێکەوە ودەنگیان بەرز بویەوە وپێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {إِنَّمَا هَلَكَتِ الْأُمَمُ قَبْلَكُمْ بِاخْتِلَافِهِمْ فِي الْكِتَابِ /مسلم/ گەلانی پێش ئێوە هەرلەبەرئەوە لە ناوچوون کەنارێك بوون لە بارەی کتێبەکەیانەوە} وە لە ریوایەتێکی تردا کە ئیمامی

احمد باسی دەكات دەفەرموێ: {إن القرآن لم ينزل يكذب بعضه بعضا بل يصدق بعضه بعضا فما عرفتم منه فاعملوا به وما جهلتم منه فردوه إلى عالمه /صححه الالبا / بەراستی قورئان نەهاتوە هەندێك هەندێكی بە درۆ بخاتەوە بەڵكو هەر بەشێكی دان بەراستی ئەویتردا دەنێت جا ئەوەی كە دەزانن لەو ئیشی پێ بكەن و ئەوەش كە نایزانن بیگەڕێننەوە بۆ لای زانەری} وەك پەروەدگار دەفەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ الأنبياء: ٧/ پرسیار لە ئەهلی قورئان بكەن ئەوەی كە نایزانن ﴾ وە دەفەرموێ: ﴿وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ﴾ یوسف: ٧٦/ بە سەر هەمو خاوەن زانینێكدا زاناتر هەیە﴾ جا دەبێ تەماشای قورئان زۆر بە ڕێزەوە بكەین‌و كێشە لە سەر ئایەتەكانی دروست نەكەین‌و بە كەیفی خۆمان مانای نەكەین، جا هەرچیمان زانی با ئیشی پێ بكەین‌و ئەوەیشمان نەزانی با پرسیار لە خۆمان زاناتر بكەین، زانایش ئەو كەسە نیە كە زمانی عەرەبی بزانێت زانا ئەو كەسەیە كە قورئان بزانێت. ئینجا الله تەمیەی موسڵمانان دەكات كە زمانی خۆیان بگرن‌و هەوڵ نەدەن هەرچی ببیسن باسی بكەن‌و دەفەرموێ:

(٨٣) هەركاتێ ئەوان خەبەرێكیان پێ بگات چ لە بارەی ئاسایشەوە یان لە بارەی ترسەوە بڵاوی دەكەنەوە، وە ئەگەر ئەوان ئەو خەبەرەیان بۆ پێغەمبەرﷺ ببردایەو بۆ لای بەرپرسەكانیان ئەوان دەیانزانی كە چۆن ڕەفتار بكەن لە گەڵ ئەو خەبەرەدا واتە نەدەبو ئەو قسانە بڵاو بكەنەوە هەتا نەڵێن بە فەرماندەكەی خۆیان جا ئەو فەرماندەیە ئەگەر وتی: ئەو قسەیە بڵاو بكەنەوە یان بڵاوی نەكەنەوە دەبێ بە قسەی بكەن‌و نا بێ سەربەخۆ هەواڵەكان بڵاو بكەنەوە، موسڵمانان دەبێ زاڵ بن بە سەر زمانی خۆیانداو قسە نەدركێنن بەبێ فەرمانی فەرماندە، وە ئەگەر فەزڵ‌و ڕەحمەتی خوا نەبوایە كە ئێوەی هیدایەت داو ڕێگەی پێشان دان بەراستی ئێوە دەكەوتنە شوین شەیتان مەگەر كۆمەڵێكی كەمتان. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {كفى بالمرء كذبا أن يحدث بكل ما سمع /مسلم وابوداود /بەسە كە مرۆڤ بە درۆزن دابنرێت كە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە} چونكە لە ڕاستی دا هەواڵەكان زۆریان درۆن‌و كابرا دەبێ بە درۆزن. ئینجا خوای گەورەو زانا داوا لە بەندە ڕاستو پاكەكەی كە پێغەمبەریەتیﷺ دەكات كە ڕاستەو خۆ خۆی غەزا بكات و دەفەرموێ:

(٨٤) ئەی محمدﷺ غەزا بكە لە ڕێگای خوادا كە داوای هیچ خەرجی‌و كەرەسەی غەزات لێ ناكرێت مەگەر بۆخۆتو تەنها ئەركی خۆتت لەسەرە، وە موسڵمانان هان بدە لە سەر غەزا نزیكە الله شەڕی ئەو كەسانەی كە كافرو بێ باوڕن لایدات لێت، وە الله زۆر زۆر بەهێزە لە بارەی شەڕەوەو ترسی لە كەس نیەو زۆر بەهێزە لە تۆڵە سەندنەوەدا. واتە تۆ ئەگەر خۆت ئامادەی غەزاكردو موسڵمانانت هەڵنا بۆغەزا زۆر نزیكە كافران لە شەڕ بوەستن چونكە دەترسن‌و خۆدوور ئەگرن‌و تەماع ناكەنە سەروەت‌و سامانی موسڵمانان هەر بۆیە الله داوا دەكات كە لە بەرامبەری ستەمكارەوە بوستن، چونكە ئەگەر بەرامبەری نەوەستن زاڵم ڕەحمتان پێ ناكات، ئەو دنیای دەوێت كاتێ دی كە موسڵمانان هۆشیارن ئەویش لە ترسا دەكشێتەوە واتە شەڕ كردن لە ئیسلامدا بۆنەمانی شەڕە ئەگینا شەڕ خۆی مەبەست نیە مەبەستی ئیسلام گەیاندنی ئەو ئاینەی خوایە بە خەڵكی‌و دابین كردنی ئاسایشە، جا هەر كەسێك ڕێگا لەیەكێك لەو دوانە بگرێت شەڕی لە گەڵدا دەكرێت‌و نابێ موسڵمان لەو بێ باوەڕو خراپە كارانە بترسن. بزانە فەرماندەی موسڵمانان پێشەكی هەرتەكلیفی دابین كردنی ژیانی خۆی لێ دەكرێت. پێویستە فەرماندەش خەڵك هەڵ بنێت بۆجیهاد نەك وەكو مردوەكانی ئەمڕۆ ڕەفتار بكات‌و ماوە نەدات كەس باسی جیهاد بكات چونكە ئاغاكانیان لێیان عاجز دەبن‌و تەنانەت ماوەی خوێندنەوەی پەڕاوە جیهادیە كانیش بە پەیڕەوانیان نادەن، نازانم ئەوان باشتر دەزانن یان خوا كە دەفەرموێ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَلَى ٱلْقِتَالِ ﴾ الأنفال: ٦٥: باوەڕداران هەڵ بنێن بۆغەزا ﴾؟!! دەی بیر بكەنەوە ئەی خاوەن باوەڕان پێش ئەوەی كە ڕۆژێ بێت كە بیر كردنەوە سودی نەبێت‌و بڵێن: ﴿ئەی پەروەردگارمان بەراستی ئێمە بە گوێی سەرۆكەكانمان‌و گەورەكانمان كردو ئەوانیش ئێمەیان گومڕاه كرد﴾ الاحزاب :٦٧. ئەوە بو پێغەمبەری ئازیزمان ﷺلە كاتی غەزای بەدردا كە خەریكی ڕێك كردنی ریزی موسڵمانان بو فەرموی: {قوموا إلى جنة عرضها السموات والأرض /مسلم وغ ه/هەڵسن شەڕبكەن بۆدەست كەوتنی بەهەشتێك كە پانایییەكەی بە ئەندازەی ئاسمانان‌و زەوییە}. جا ئەمە لە كوێ‌و شاردنەوەی ئایەتە كانی جیهادو پەڕاوەكانی جیهادی لەكوێ؟! ئینجا الله باسی تكا كردنمان بۆ دەكات‌و دەفەرموێ:

(٨٥) هەر كەسێك شەفاعەتی چاك بكات بەشێكی چاك بۆ ئەو هەیە و پاداشتی پێ دەدرێتەوە لە سەر ئەو ئیشە چاكەی كە دەیكات. وە هەر كەسێك شەفاعەتێكی خراپ بكات بۆ ئەویش بەشێكی تاوان هەیە وەك كابرای تاوانكار، وە بەراستی الله حافیزو نیگەهبانە بە سەر هەمو شتێكداو هیچ شتێكی لێ ون نابێت‌و ئاگادارە كە ئەو پاڵپشتی وشەفاعەتانە كامیان ڕاستەو لە بەر خوایەو كامیشیان ناراستەو دژی ئایینی خوایە، پێغەمبەرﷺ

ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا ﴿٨٧﴾ ۞ فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿٨٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ﴿٨٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ﴿٩٠﴾ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا ﴿٩١﴾

دەفەرموێ: {**اشْفَعُوا تُؤْجَرُوا وَيَقْضِي اللهُ عَلَى لِسَانِ نَبِيهِ ﷺ مَا شَاءَ** /منفق عليه /پاڵپشتیو شەفاعەت بکەن پاداشتتان دەست دەکەوێت ، وە خوا ئەوەی کە ئارەزۆی لێ بێت بە زمانی پێغەمبەرەکەیدا ﷺ دەی هێنێت} ئینجا ﷻ موسڵمانان فێری رەوشتێکی تر دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٨٦﴾ ئەوسا هەر کاتێك سەلامتان لێ کرا وەڵامی ئەو سەلامە بدەنەوە بە باشتر لە خۆی یان وەکو خۆی بە بێگومان کە ﷻ لێکۆڵەرەوەیەو ئاگای لە هەمو شت هەیەو لێی دەکۆڵێتەوە. واتە ئەگەر کەسێك پێی وتی: (السلام عليكم) بڵێ: (**وعليكم السلام ور ة ا** )کە ئەمە باشترە یان وەکو خۆی بڵێ(وعليكم السلام)وە ئەگەر وترا:(السلام عليكم ورحمه الله) تۆیش یان وەکو خۆی وەڵامی بدەرەوە یان باشتر کە(وبركاته)ی بۆ زیاد بکەی وە ئەگەر ئەو وتی: (**السلام عليكم ور ة ا وبركاته**) باش وایە شتێکی تر زیاد نەکەن لە وەڵامەکەیدا بەڵکو وەکو خۆی بڵێن، وە هەر وشەیەك لەوانە خێرێکی زیاتری هەیە واتە کە بڵێی: (السلام عليك) خێری دە چاکەیە وە ئەگەر وتت: ( السلام عليكم ورحمه الله) بیست چاکەیە وە ئەگەر وتت: (السلام عليكم ورحمه الله وبركاته) خێری سی چاکەی هەیە وە ئەم سەلام کردنە هۆی خۆشەویستیە لە نێوان موسڵمانان دا و بەم سەلام کردنە سابت دەبێت کە ئەو مرۆڤە ئیماندارەو ئیمانیش دەیباتە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**لَا تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا أَوَلَا أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيْءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ أَفْشُوا السَّلَامَ بَيْنَكُمْ** /مسلم وغ ه/ ئێوە ناچنەبەهەشتەوە هەتا ئیمان نەهێننو ئیمانتان نیە هەتا یەکترتان خۆش نەوێت ئایا دەتانەوێت کە کەلیمەیەکتان پێ پیشان بدەم کە ئەو کەلیمەیە ببێتە هۆی ئیمان زیاد بوون بۆ ئێوەو ببێت بە هۆی خۆشەویستی؟ زۆر سەلام بکەن لە نێوان خۆتاندا} جا لە بەر ئەوە دەڵێن کە یارەکانی پێغەمبەرﷺ کە ئەیان دا بە لای درەختێکا یەکێکیان لەم دیوەو یەکێکیان لەو دیوە دەچوون کە بە یەك دەگەیشتن دەیان وت: (السلام عليكم) لە بەر ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺ کەوا بو وەڵام دانەوەی سەلام وەك خۆی واجبە، وە بەباشتر لەخۆی شتێکی چاکە. ئینجا خوای دانا توانایی خۆیمان پێ دەناسێنێتو سوێند دەخوات کە رۆژی قیامەت دێتو هەمو کۆ دەکرێنەوەو دەفەرموێ:

﴿٨٧﴾خوا ئەو زاتەیە کە هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نیە بێجگە لەخۆی، سوێند بێ ، کۆتان دەکاتەوە لە رۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانی تێدا نیە، وەئەمەقسەی ﷲ یە جا کێ هەیە لە قسەدا راستگۆتر بێت لە ﷲ؟.

﴿٨٨﴾ پێشەکی با هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە بزانین، دەڵێن کاتێك کە پێغەمبەرﷺ تەشریفی برد بۆ غەزای ئوحود، لە رێگادا عەبدوڵا ی کوڕی ئوبەی کە گەورەی مونافقان بو گەڕایەوەو سێ سەد کەسیشی لە گەڵ خۆی گەڕاندەوە. واتە هەزار نەفەر ئامادە بون بۆ شەڕی ئوحود، بەڵام ئەو کاتە کە گەرایەوە سێ یەکی گەراندەوەو پێغەمبەرﷺ حەوت سەدکەسی لە گەڵ دا مایەوە جا ئەوانەی کە چوونە جیهادەکەوە قسەیان لە بارەی ئەم گەڕاوانەوە دەکرد هەندێك دەیان وت: ئەوانە کافرن، وە هەندێك دەیان وت: موسڵمانن. قورئان دابەزی فەرموی: جائەوە بۆ ئێوە لە بارەی مونافقانەوە دوو بەشنو دوو قسەتان هەیە لەحاڵێکدا ﷲ ئەوانی شکەست پێداوەو بە هیلاکی بردون بە هۆی ئەو کردارە خراپانەیان کە کردویانەو گەڕاونەتەوە ئایا دەتانەوێت کەسێك کە خوا گومڕای کردوە هیدایەتی بدەن؟ وەئەو کەسەی کە خوا گومڕای بکات ئیتر رێگای تر نابینی بۆ هیدایەتی ئەو. بەراستی ئەوانە بە بۆنەی کاری نالەباری خۆیانەوە گومڕا بوون.

﴿٨٩﴾ ئەوانە ئاوات دەخوازن کە ئێوە کافربن وەك چون ئەوان کافرن ئەوسا وەك یەك دبن جا هەرگیز لەوان تا کۆچ نەکەن لە رێگای خوادا دۆست بۆخۆتان نەگرن خۆئەگەر پشتیان هەڵچەرخان لەم ئاینە ئەوسا بیانگرنو بیانکوژن لە هەر کوێدا دەستتان کەوتنو هەرگیز لە ناو ئەواندا کەسیان بەدۆستو یارمەتیدەرو چاو ساغی خۆتان پەسەند نەکەن.

وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٍ أَن يَقۡتُلَ مُؤۡمِنًا إِلَّا خَطَـًٔاۚ وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـًٔا فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ وَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْۚ فَإِن كَانَ مِن قَوۡمٍ عَدُوّٖ لَّكُمۡ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ وَإِن كَانَ مِن قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞ فَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ وَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ شَهۡرَيۡنِ مُتَتَابِعَيۡنِ تَوۡبَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٩٢﴾ وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدٗا فِيهَا وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمٗا ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿٩٤﴾

﴿٩٠﴾ مەگەر ئەو كەسانەی كە پەیوەندیان بەگەلێكەوە هەبێتو ئێوە لە گەڵ ئەو گەلەدا پەیمانی بەتوتان هەبێت یان مەگەر لە گەل كۆمەڵێك كە دێن بۆلای ئێوە كەدوودڵن نایانەوێ لەگەڵ خزمانی خۆیاندا شەڕتان لە گەڵدا بكەن یان لەگەڵ ئێوەدا شەڕ لەدژی خزمانی خویاندا بكەن، خۆ ئەگەر اللهئارەزۆی لێبێت ئەوانە زاڵ دەكات بە سەر ئێوەدا ئەوسا شەڕتان لە گەلدا دەكەن كەوابوو ئەگەر ئەوان دورەپەرێزیو كەنارەگیریان كردو شەڕیان لە گەڵدا نەكردنو رێبازی ئاشتەواییان گرتەبەرو پێشنیاری سوڵحیان دا ئەوسا ئیتر الله بۆ ئێوە هیچ رێگایەكی تری دژ بەئەوان دانەناوە. هیچ رێگایەكی تر نیە نە بە ئاشكراو نە بە فرو فێڵ، بەڵكو ئیسلام ئەوە بە شتێكی حەرام دەزانێت، جا دەركەوت كە ئیسلام ئاینی شەڕ نیە بەڵكو دینی ئاشتیە ئەوەتە ئەگەر كابرای كافر وتی: شەڕ ناكەم كابرای موسڵمان بۆی نیە شەڕ بكات. ئەوەیە ئاینی ئیسلامو ئاوەها بێباوەڕان دەپارێزێو بە خێویان دەكات، بەڵام دەبینین كە بێباوەڕان كاتێ حوكم دەگرنە دەست بە هەزاران موسڵمان دەگرنو شەهیدیان دەكەن. هەر لە ئەلبانیا بە یەك رۆژ یەك هەزار مزگەوتیان تێك دا جا گوناهی مزگەوت چی بو؟ ئاشكرایە كە ئیسلام پەیرەوانی خۆی سەر شۆڕ ناكات كاتێ كە بزانێ دوژمنانی راست ناكەن لە خۆپاراستن لە شەڕ دەفەرموێ:

﴿٩١﴾ كۆمەڵێكی تر تان دەستدەكەوێت كە دەیانەوێ ئێوە ئێمن كەنەوەو دڵنیاتان بكەن كە ئەوان نە ئیشی خراپ دەكەن و نە نیەتی خراپیان لە گەڵ ئێوەدا هەیە، وە گەلەكەی خۆیشیان ئێمن دەكەنەوەو دەڵێن: نەچنە لای ئەوانو ئیشی ئێمە ئاشكرا بكەن با نەمان ناسن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین، ئەمانە هەر كاتێك كە بانگیان بكەنەوە بۆ شیركو بت پەرستی دووبارە دەرۆنەوە سەر وەزعەكەی خۆیانو موشریك دەبنەوەو بەڵاو موسیبەت دروست دەكەن بۆموسڵمانان ، جا ئەگەر ئەوان دورە پەرێزیان نەكرد لێتانو وازیان لێ نەهێنانو دەستی ئاشتەوایو سوڵحیان بۆ درێژ نەكردنو دەستی خۆیان نەگرتەوە لە شەڕو ئاژاوە دژ بە ئێوە دەی ئێوەش لە هەر كوێدا پەیداتان كردن بیانگرنو بیان كوژن، بە ئێوە دەسەڵاتێكی گەورەی ئاشكرامان داوە لە دژی ئەوان. واتە بۆ ئێوە هەیە لە دژی ئەوان هەر حوكمێك كە پێتان چاك بێت بیكەن لە گرتنو لە كوشتنو لە دەركردن، چونكە خۆیان هۆی ئەو رۆژ رەشیو زەلیلیو سەر شۆڕیەن، لەم چەند ئایەتەدا شێوازی هەڵسوكەوت لەبارەی بێباوەڕان بەتایبەت دووروەكانە باسكرا، جا كران بە سێ بەشەوە: **بەشی یەكەم** ـ ئەوانەن كە هاوپەیمانن لەگەڵ گەلێكدا كە لە گەڵ موسلماناندا پەیمانی ئاشتەواییان لە بەینداییە ئەم بەشە شەڕیان لەگەڵدا ناكرێتو وەك گەلە هاوپەیمانەكەیان حیسابیان بۆ دەكرێت. **بەشی دووهەم** ـ ئەوانەن كە نە دەیانەوێت لەگەڵ بێباوەڕاندا بنو دژ بە موسڵمانان شەڕ بكەن، وە نە دەیانەوێت لەگەڵ موسڵماناندا بنو دژ بە بێباوەڕان شەر بكەن، لەگەڵ ئەمانەشدا شەڕناكرێت چونكە ئەگەر ئەمانە ناچار بن شەڕ بكەن یان ئەوەتە لەگەڵ موسڵماناندا دەبن كە ئەمەش زۆر دوورە یان ئەوەتە لە گەڵ بێباوەڕان دا دەبن جا دەبن بە هۆی زاڵبونیان بە سەر موسڵماندا، وە **بەشی سێهەمیش** ـ ئەوانەن بە هۆی ترسەوە هەڵویستێكی دووروانە دەنوێنن جا ئەمانەش ئەگەر دەست درێژی نەكەنەسەر موسڵمانانو وازیان لێ بهێنن ئەوا ئەوانیش شەڕیان لەگەڵدا ناكرێت. پاشان هەر بەبۆنەی كوشتنەوە باسی جۆرێكی تر لەكوشتن دەكاتو دەفەرموێ:

﴿٩٢﴾ بۆ هیچ ئیماندارێك نیە كە ئیماندارێك بكوژێت مەگەر بە هەڵە، وە هەر كەسێك خاوەن باوەڕێك بكوژێت بە هەڵە جا ئەوە دەبێت بەندەیەكی موسڵمان ئازاد بكاتو دەبێ نرخی خوێنێك تەسلیمی ئەهلی كابرای كوژراو بكات مەگەر خۆیان عەفوی بكەنو لێی وەرنەگرن جا ئەگەر ئەو كابرایە لە گەلێكی دوژمنتان بو بەڵام ئەو كوژراوە باوەڕدار بو ئەوە تەنها بەندەیەك ئازاد دەكرێتو هیچی تر، خوێن نادرێت بەو گەلە دوژمنە ئەگەر لە

نێوان ئەودوژمنەو موسڵمانانادا هیچ عەهدو پەیمانێك نەبو، وە ئەگەر گەلێك بو كە لە بەینی ئێوەو ئەو گەلەدا عەهدو پەیمانێك هەبو جائەمە پێویستە خوێنێك تەسلیم بكرێت بەوانو دە بێ بەندەیەكی ئیمانداریش ئازاد بكات، جا كەسێك كەئەمانەی دەست نەكەوت دەبێ دوو مانگ بەسەر یەكەوە ڕۆژوو بگرێتو دەبێ بەراستیش لەلای خوا تەوبە بكات لەو تاوانە كە كردویەتی، وە خوا زانەرەو ئیشەكانی بە حیكمەتە.. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {لا يَحِل دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ وَأَني رَسُولُ اللهِ إِلا بِإِحْدَى ثَلاثٍ النفسُ بِالنفسِ وَالثيبُ الزانِي وَالْمَارِقُ مِنَ الدين التاركُ لِلْجَمَاعَةِ /منفق عليه/ حەرامە ڕشتنی خوێنی مرۆڤێكی موسڵمان كە شایەتمانی هێنا بێ بە خواو بە پێغەمبەرﷺ مەگەر بە یەكێ لەم سێ هۆیانە: یەكەم ـ گیان لەباتی گیان دا واتە كەسێ بە ناحەق كەسێك بكوژێت دەكوژرێتەوە. دووەهەم ـ كەسێ بە نیكاحی حەڵاڵ جیماعی كردبێت پیاوبێت یان ئافرەت ئەگەر زینای كرد دەكوژرێتەوە. سێهەم ـ ئەو كەسەی پاش گەز ببێتەوە لە ئایینو جیاببێتەوە لە كۆمەڵی موسڵمانان.

ئینجا سەبارەت بەو كەسەی كە موسڵمانێك بە بڕیارو بەقەسدی بكوژێت دەفەرموێ:

(٩٣) هەر كەسێك باوەڕدارێك بە دەستی ئەنقەس بكوژێت ئەوە تۆڵەكەی جەهەنمە بۆ هەمیشە كەتێیدا دەمێنێتەوەو خوا ڕقیەتی لێیو نەفرینی دەكاتو سزایەكی زۆر گەورەی بۆ داناوە،

جا ئەگەر ئەم كوشتنە بە حەڵاڵ بزانێت ئەوە كافرەو سزاكەی جەهەنمە بۆ هەمیشە بەڵام ئەگەر بە حەڵاڵی نەزانێتو تەوبە نەكات ئەوە ماوەیەكی زۆر لە جەهەنمدا دەمێنێتەوە هەروەكو پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: {لَو أنّ أهلَ السمواتِ وَ الأرض اجتَمَعُوا عَلى قتل مُسلِم ؛ لَأكبهُمُ ا ُ جَميعاً عَلى وجوههم النار/الط ا ، صحه الالبا / ئەگەر هاتو ئەهلی ئاسمانانو زەوی (دیارە ئەهلی ئاسمانان فریشتەن) هەمویان كۆببنەوە لە سەر ئەوەی یەك ئیماندار بكوژن بە ناحەق الله هەمویان دەخاتە ناو ئاگری جەهەنمەوە}

وە ودیسان دەفەرموێ: {قَتْلُ الْمُؤْمِنِ أَعْظَمُ عِنْدَ اللهِ مِنْ زَوَالِ الدنْيَا /النسائي، صححه الالبا / كوشتنی باوەڕدار گەورەترە لە نەهێشتنی هەمو دنیا} كوشتنی موسڵمان بەناحەق ئەوندە تاوانێكی گەورەیە كە پێغەمبەری خوا لە گەڵ هاوبەشی دانان بۆخوا ناوی دەباتو دەفەرموێ: {كل ذنبٍ عَسَى ا ُ يَغفِرُه، إلا مَنْ مات مُشركًا، أَوْ قَتَلَ مُؤْمنًا مُتَعَمدًا / البزار، صححه الالبا / هەمو تاوانێك نزیكە كە الله لێیخۆش بێت جگە لەو كەسەی كە بە موشریكی مردبێت یان ئەو كەسەی باوەڕدارێكی بە ئەنقەست كوشتبێت}

لَّا يَسْتَوِي ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْۚ فَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ دَرَجَةًۚ وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰۚ وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٩٥﴾ دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةًۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْۖ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي ٱلْأَرْضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿٩٧﴾ إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ﴿٩٨﴾ فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾ ۞ وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةًۚ وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُواْ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾

(٩٤) ئەی خاوەن باوەڕان هەر كاتێك كە دەرچون بۆ جیهاد لە ڕێگای خوادا ئەوسا چاك شت ڕۆشن بكەنەوە هەر لە خۆتانەوە خەڵك نەكوژنو هەر كەسێك كە پێتان گەیشتو وتی: من موسڵمانم پێی نەڵێن نەخێر موسڵمان نیت، ئایا ئێوە كەلوپەلێكی دنیاییتان دەوێت؟ ئێوە ئەگەر كەلوپەلوسامانی دنیاییتان دەوێت ئەوسا لەلای خوا غەنیمەتی زۆر هەیە ئێوەش لە پێشەوە هەر ئاوەها بێ دین بون جا خوا منەتی خستە سەرتانو بوون بە موسڵمان كەوا بو جوان شت ڕۆشن بكەنەوە، هەر لە خۆتانەوە خەڵك نەكوژن بە بێگومان الله بەوەی كە ئێوە دەیكەن ئاگادارە. هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە دەڵێن جارێك كابرایەكی بەنی سولەیم دای بە لای هەندێ لە یارەكانی پێغەمبەرداﷺ هەندێ مەڕو ماڵاتی پێ بو سەلامی لێ كردن ئەوانیش وتیان: بۆیە سەلامی كردوە تا وازی لێ بهێنین لێیان داو كوشتیانو مەڕو ماڵاتەكەیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەرﷺو ئەم ئایەتە دابەزی. بەم شێوەیە خوا هەڕەشەی لێ كردنو ترساندنی لەوەی كە جارێكی تر شتی ئاوەها بكەن تەماشا كەن خوای گەورەو میهرەبان چۆن تێمان دەگەیەنێتو چۆن بۆمان ڕۆشن دەكاتەوە كە نەكەن غەزا لەبەر ماڵی دنیا یان ڕقو تۆڵە سەندنەوە بێت بەڵكودەبێ تەنها لە بەر خاتری خوا بێو بە ئەمری ئەو بێ، جا كە باسی كەفارەتی خوێنی كوشتنی بەناحەقی كرد، نەك موجاهیدان سارد ببنەوە لە جیهادو دانیشنو هەروەها

ئەوانەش کە دەرنەچون بۆ جیهاد ئەم هەڵانەی کە لە موجاهیدانەوە روودەدات بیکەن بەبەڵگەو بڵێن: دانیشتنی ئێمە باشتر بو لەو جیهادەی ئێوە ، بۆیە باسی پلەی موجاهیدمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٩٥) هەرگیز دانیشتوانی باوەڕدار بێجگە لەوانەی کەوا دوچاری زیان بوون وەك کوێرو شەلو نەخۆش، وەئەوانەی کەجیهاد دەکەن لە رێگای خوادا بە نەفسو ماڵی خۆیان وەکو یەك نینو لە لای خواو پلەیان وەك یەك نیەبەڵکو خوای گەورە ئەو کەسانەی کە جیهاد دەکەن بە ماڵو گیانیان چەند پلەی زیاتری پێداون لەوانەی کە دانیشتوون، بەڵام خوا بە هەمویان بەڵێنی بەهەشتی داوە. مادام هەر باوەڕ دار بێت با داشبنیشێت لە ماڵەوە، بەڵام بۆ شەهیدان سەد پلە هەیە نێوانی هەر کامیان وەکو نێوان ئاسمان وزەوی وایەو ﷲ زیادەی داوە بە جیهاد کەران بە سەر دانیشتوەکاندا بە پاداشتێکی زۆر گەورە ، وە ئەو پاداشەش بریتیە لە:

(٩٦) چەند پلەی بەرز لە لایەن خواوەو لێخۆشبونی خوا لە تاوانەکانیانو سۆزی خوا بۆیان، وەخوا لێخۆشبوو میهرەبانە بەرامبەر بە ئیمانداران. کاتێك کە ئەم ئایەتە واتە ﴿لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ وَٱلۡمُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ ...﴾ دابەزی ﴿غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾ تێدا نەبوو، عەبدوڵا ی کوڕی ئومی مەکتوم کە کوێر بو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەی ئەوانەی کە ناتوانن جیهاد بکەن وەکو کوێرو وێنەکانی؟ زەید دەڵێ: بە خوا سوێندە دەخۆم قسەکەی تەواو نەبو یان هەر ئەوەندەی پێچوو کە قسەکەی تەواوبو وەحی بۆ پێغەمبەرﷺ دابەزیو فەرموی:﴿غَيۡرُ أُوْلِي ٱلضَّرَرِ﴾ واتە بێجگە لەو باوەڕدارانەی کەوا تووشی زیان بوون بۆ ئەوانەش هەر حیسابی گەورەیان بۆ دەکرێت بە گوێرەی نیەتی خۆیان﴾ هەر لەم ماناداو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {إن بالمدينة لأقواما ما سرتم من مسير ولا قطعتم واديا إلا كانوا معكم قالوا وهم اليوم بالمدينة قال : نعم حبسهم العذر /منفق عليه/ کۆمەڵێك لە مەدینەدا هەن ئێوە هیچ هەنگاوێکتان نەناوەو هیچ شیوێکتان نەبڕیوە مەگەر ئەوانیش لە گەڵتاندا بوون، وتیان: خۆ ئەوان ئێستا لەمەدینەش دانیشتوونو نەهاتونە دەرەوە بۆ جیهاد؟ فەرموی: بەڵێ، عوز رێگری کردوون کە بێن لەگەڵماندا}

(٩٧) بەبێشك ئەوانەی کە زوڵمیان کردوە لە نەفسی خۆیان کە کۆچیا نەکردوە لە رێگەی خواداو نەچونەتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ مەبەست لێرە ئەو موسڵمانانەیە کە لە مەکەدا مانەوەو کۆچیان نەکرد، بەڵام ئایەتەکە گشتیە بۆ هەموکاتو ساتێکە کەموسڵمان لە جێگای خۆیدا نەتوانێت بە ئازادانە بانگەوازی ئایین بکات. جا ئەمانە فریشتەکان لە کاتی سەرە مەرگ داو لە رۆژی دوایدا پێیان دەڵێن ئێوە لە کوێ بوون؟ دەڵێن: ئێمە مرۆڤانی لاوازو بێ دەسەڵات بوین لە سەر زەویدا، پێیان دەڵێن: ئایا ئەو زەویەی خوا فرەوان نەبو کە کۆچی تێدا بکەن بۆ دانیشتوون لەو جێگادا کە ستەمتان لێ بکەن؟ چونکە ئەوەی کە ئەبێت بە هۆی زاڵ بونی ستەمکار بە سەرمرۆڤدا یان مەقامە یان سەرمایەیە یان عەشرەتو ماڵو منالە کابرا دەڵێ چۆن عەشرەتەکەم بە جێ بهێڵم؟ چۆن خێزانو ماڵم بە جێ بهێڵم؟ جا خواش دەفەرموێ: سامادام ئەوانە کۆچیان نەکردوە شوێنیان جەهەننەمو پیسترین جێگەیە جەهەننەم. کەسانێك کە کۆچ ناکەن لە رێگای خواداوگوێ نادەن بە جیهاد، بەڵام دەڵێن ئیمانداریں، نوێژ دەکەنو رۆژو دەگرنو هیچی تر ناکەن ئەمانە خوا ئاوەها حیسابیان بۆ دەکات جا حیسابی ئەوانە چۆنە کە نەك خۆیان بۆی هەڵناسن بەڵکو خەڵکیش لە جیهادو هیجرت سارد دەکەنەوە؟! سا با هەر موسڵمانێك تەماشای خۆی بکاتو خۆی لێکۆڵینەوەیەك لەگەڵ خۆیدا بکات ئەوە ئاییەنو قیامەتەو هەرکەس بۆخۆیەتی. لێرەدا کەباسی کۆچکردنی کرد ئەمانە جیا دەکاتەوە لەو سزایەو دەفەرموێ:

(٩٨) بیجگە لەو لاوازانە لە پیاوانو ژنانو منالأنێك کە هیچ فرو فێڵێك نەدۆزنەوە بۆ خۆ دەرباز کردنو رێگایەکیش نەدۆزنەوە کە خۆیان رزگار بکەن.

(٩٩) جا ئائەمانە نزیکە خوا لێیان خۆش ببێت، وە خوا چاوپۆشیکەرو لێخۆشبوە بۆ موسڵمانان.

کە باسی کۆچکردنی کردو داوای کرد کە کۆچ بکەن ئەگەر نەیان کرد ئەو سزا گەورەیان بۆ هەیە ئەی ئەگەر کۆچ بکەن پاداشەکانیان چۆنە؟ دەفەرموێ:

(١٠٠) جا ئەو کەسەی کە کۆچ دەکاتو دەردەچێت لە ماڵی خۆی لە بەر خاتری خوا لە زەویدا جێگای زۆری دەست دەکەوێت چ لە بارەی رۆزیەوە چ لە بارەی جێگاوە، وە ئەگەر کەسێك دەرچوو لە ماڵی خۆیدا لەکاتێکدا کۆچەکەی بۆ لای خواو پێغەمبەرەکەیەﷺ وە تەنها بۆ بەرز کرردنەوەی دینەکەی خوا هیجرەت دەکات، لەپاشان مرد پێش ئەوەی بگات بەو شوێنە کە مەبەستی هەبووە بەراستی ئەوە پاداشتی لای خوای خۆی مسۆگەر کردووە ﷲ لێبوردەیە لە گوناهەکانو بە سۆزیشە بەرامبەر بە ئیمانداران. وتراوە هۆی دابەزینی ئەم ئایەتانە " زەمرەی کوڕی جوندوب

وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُوا۟ فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّوا۟ فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ ۗ وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾ فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾

بووە، ئەم پیاوە لە مەکە توشی نەخۆشی بو جا ترسا کە بمرێتو نەتوانێت ئەو هیجرەتەی کە فەرمانی پێکراوە بەجێی بهێنێتو پاداشتەکەیشی لە دەست بچوێت جا داوای کرد کە ببیەن بۆ مەدینە بەڵام پێش گەیشتن بە مەدینە لە رێدا مرد جا بێباوەرانیش گاڵتەیان پێدەکردوو دەیان وت: ئەوەی کەویستی پێی نەگەیشت، جا ئەم ئایەتانە دابەزین، ئاشکرایە دەرچوون بۆ بەرز کردنەوەی ئایینی خوا هەر وا شتێکی ئاسان نیە بەڵکو سەدان کۆسپو تەگەرە دێنە رێگایو لە چەندین لاوە مەترسی روی تێدەکات تەنانەت هەندێ جار ناتوانێت فەرزێکی وەك نوێژ بە ئاسودەییو بەئیسراحەت ئەنجام بدات لە بەر ئەوە خوای زاناو دانا چونیەتیو چەندیەتی ئەو نوێژانەمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٠١﴾ ئەگەر چوون بۆ سەفەر جا بۆ جیهاد بێت یان بۆ کەسابەتی حەڵاڵ هیچ تاوانێك نیە کە ئێوە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە ئەگەر ترسان کافران دوچاری بەڵاتان بکەن، ئەم فتنەیە لێرەدا بە مانای سەختیو بەڵایە، بەراستی بزانن کە کافران بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکران. واتە مرۆڤ دەتوانێت لە سەفەردا نوێژەکانی کورت بکاتەوە لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە کە نوێژی چوار رکاتی دەکرێت بە دوو رکات، بەڵام نوێژەکانی بەیانیو مەغریب کورت ناکرێنەوە ئەم ئایەتە هەم بۆ کورت کردنەوی نوێژەکانەو هەم بۆ چۆن کردنی نوێژەکانە کە بۆ دووهەمیان زیاتر سازگارە، ئینجا بۆچۆنیەتی نوێژکردن لە گەرمەی شەڕادا دەفەرموێ:

﴿١٠٢﴾ وە ئەگەرتۆ لە ناو ئەواندا بوی ئەی محمدﷺ، دیارە لە پاش پێغەمبەرﷺ هەر ئیمامو فەرماندەیەك هەبێت لە شەڕەکاندا پێویستە ئاوەها بکات جاکە هەستای بۆ ئەوەی کە نوێژیان بۆ بکەیت با کۆمەڵێك لەوان لە گەڵ تۆدا بوەستێت بۆ نوێژو با چەکی خۆیان پێ بێت جا هەر کاتێك کە ئەوان چوون بۆ سوجدە با ئەوانەی کە لەپاشەوەن بە پێوە بوەستن بۆ پاسەوانی یان با لەسەنگەردا بمێننەوەو بێ ئاگا نەبن لە دوژمن، وە هەر کاتێ ئەوان هەستانەوە یان تەواویان کرد، ئەو تائیفەیەی کە نوێژیان نەکردوە با بێن لە گەڵ تۆدا نوێژ بکەنو ئەمجارە ئەمانە دەبێ زۆر وریا بنو چەکی خۆیان پێ بێت چونکە بەراستی کافران ئاوات دەخوازن کە ئێوە نەختێك بێ ئاگا ببن لە چەکەکانتانولە کەلو پەلەکانتان جا ئەو کاتە ئەوان هێرشێکی کوتو پڕتان بکەنە سەر جا لە بەر ئەوە دەبێ هەم وریا بن، وە هەم دەبێ چەکەکانتان پێ بێ، ئینجا سەبارەت بەو موسڵمانانەی کە چەکەکانیان هەڵگرتوە ئەگەر بەو چەك هەڵگرتنە تووشی ئازار دەبوون ئیتر چ بە هۆی بارانەوە بێت یان بە هۆی نەخۆشیەوە بێت دەفەرموێ: تاوانتان لەسەرنیە ئەگەر چەکەکانتان دابنێن، خۆ دەبێ وریای خۆتان بنو لەدوژمن بێ ئاگانەبن بە بێگومان کە ﷲ ئامادەی کردوە بۆ بێباوەڕان سزایەکی سەرشۆڕکەرو گاڵتە پێکەر. ئەمە شێوەیەك لە شێوەکانی نوێژی کاتی ترسە (صلاة ا وف) جا لە پاش نوێژی کاتی ترس خوا فەرمانمان بە سەردا دەدات کە یادی خۆی بکەینو دەفەرموێ:

﴿١٠٣﴾ هەر کاتێ نوێژتان تەواو کرد ئیتر ئەو کاتە یادی خوا بکەن بە پێوەو بە دانیشتنەوەو بە سەر تەنیشتەوە واتە هەمیشە، چونکە بەم یاد کردنە زیاتر سۆزی خوا دەجوڵێت سەبارەت بە خوا پەرستانو زووتر بە هانایانەوە دێت. وە دەگونجێت هێمایەکیش بێت بۆ یاد کردنی خوا لە پاش هەمو نوێژەکانەوە چ لە کاتی ترسا بێت وەکو ئێرە یان لە کاتی ئیسراحەتا بێت وەکو لە فەرمودەی (صحیح)ی پێغەمبەرمانﷺ دا هاتوە کە لە پاش نوێژەکان سیو سێ جار سبحان ا ، سیو سێ جار ا مد ، سیو سێ جار ا اک وە جارێکیش (لا اله الا ا وحده لا شريك له) وە دەیان زیکری تری دەکرد، ئینجا دەفەرموێ: جا ئەگەر هاتو ئێوە کەوتنە ئاسایشەوە ئینجا نوێژەکانتان بە رێك وپێکی بکەن چونکە بەراستی نوێژ لە سەر موسڵمانان فەرزێکی کات دیارییە، واتە لەکاتی ئیسراحەتدا هەر نوێژێك لە کاتی خۆی دا بکەن.

وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ﴿١٠٧﴾ يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسۡتَخۡفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمۡ إِذۡ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرۡضَىٰ مِنَ ٱلۡقَوۡلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلۡتُمۡ عَنۡهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴿١٠٩﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿١١٢﴾ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖۚ وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمۡ تَكُن تَعۡلَمُۚ وَكَانَ فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ عَظِيمٗا ﴿١١٣﴾

هۆی دابەزینی فەرمانی نوێژی ترس (صلاة ا وف)﴿ ئەبو عەیاش دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ دا بوین لە "عوسفان" بت پەرستەکان لە روی قیبلەمانەوە بوون خالیدی کوڕی وەلید سەرپەرستیان بو، پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین وتیان: فرسەت بو چونکەئەوان بە شێوەیەك بون ئێمە ئەمانتوانی بە پەلە بدەین بە سەریانداو لەکیسمان چوو لە پاشان وتیان: ئێستە کاتی نوێژێکی تریان دێت خۆشەویستە لە لایان لە کوڕەکانیانو لە گیانی خۆیان. ئەبو عەیاش دەڵێ: جبرەئیل دابەزیو ئەم ئایەتانەی لە نێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسردا هێنا دەڵێ: کاتی نوێژ هاتو پێغەمبەری خوا فەرمانی پێدان کە هەمویان چەك لە شان بکەنو ئینجا کردنی بە دوو ریز لە پاش خۆی، وە دەڵێ: پێغەمبەر چوو بۆ رکوع هەمومان چوینە رکوعو هەڵساوە هەمومان هەڵساینەوە لە پاشان پێغەمبەر ﷺ سوجدەی برد لە گەڵ ئەو ریزەی کە لە پاشی بو، ریزەکەی ترپاسەوانیان دا بە پێوە تاکاتێ کە ئەوان سوجدەیان بردو هەستانەوە ئینجائەو ریزەکەی تر دانیشتو سوجدەی برد لە جێگای خۆیاندا لە پاش هەستانەوە ریزی دووهەم چوە شوێنی ریزی یەکەمو یەکەم هاتە جێگای دووهەم لە پاشان رکوعی بردو هەمویان رکوعیان بردو لە پاشان هەستایەوە لە روکوعو هەمویان هەستانەوە لە پاشان پێغەمبەر ﷺ سوجدەی برد لە گەڵ ئەو ریزەی دوای خۆیو ریزی دووهەم پاسەوانیان دا جا لە کاتێکا کە دانیشتن ئەوانی تریش سوجدەیان بردو دانیشتن لە پاشان پێغەمبەرﷺ سەلامی دایەوە لە گەل هەمویاندا، ئینجا ئەبو عەیاش دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم نوێژەی دوو جار کرد جارێکیان لە (عوسفان) وە جارێکی تریش لە (زەوی بەنی سەلیم) ئەبو داودو نەسائیو تەبەرانی ریوایەتی ئەم حەدیسەیان کردوە. جارێکی تر ﷲ دڵخۆشی موسڵمانان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٠٤﴾ ئێوە خۆتان لاوازو سست پێشان نەدەن بۆ بە دوا دا چونی ئەو گەلە کافرو ستەم کارانەدا بەڵکو پەلەتر بکەنو دڵودەرون زلبن چونکە ئەگەر ئێوە دوچاری ئازار دەبن خۆبە بێشك ئەوانیش دوچاری ئێشو ئازار دەبن وەك چۆن ئێوە ئێشو ئازارتان دوچار دەبێت، وە ئێوە ئومێدتان هەیە لەلایﷲ ، بەڵام ئەوان ئەو هیواو ئومێدەشیان نیە کەوابو ئێوە حەق وایە زیاتر سور بن لە سەر جیهاد ئەگەر ئەوان جارێك هێرش بکەن دەبوایە ئێوە دوو جار هێرشیان بکەن سەر، ئەگەر ئەوان شەوێك نەخەون ئێوە دووشەو نەخەوتنایە، چونکە ئەوان هیچ پاداشتیان نیە بەڵام ئێوە پاداشتی گەورەشتان هەیە، وە ﷲ زانەرە وە ئیشەکانیشی بە حیکمەتە. ئینجا ﷲ رووداوێکی ترمان بۆ باس دەکاتو بۆمان رۆشن دەکاتەوە کە حەق یەکێکەو بە کەس نابێ بە ناحەقو ناحەقیش بە کەس نابێ بە حەقو دەفەرموێ:

﴿١٠٥﴾ ئەی محمدﷺ ئێمە ئەم قورئانەمان رەوانە کرد بۆ لای تۆ بە حەقو راستی هەتا تۆش لە نێوان خەڵکدا حوکم بکەی بەو شێوەیەی کە خوا پێت دەڵێت واتە ئەی محمدﷺ حوکمەکانی تۆ پێویستە بەو شێوەیە بێت کە خوا دەفەرموێت نەك بە کەیفی خۆت ،وە ئەی محمد ﷺ تۆ نابێ بۆ ئەوانەی کە خیانەتکارن ببیت بە پاڵپشتو دیفاعیان لێ بکەیت.

﴿١٠٦﴾ داوای لێخۆشبون بکە لە خوا بەراستی خوا زۆر لێخۆش بوو بە رەحمە. لەهۆی دابەزینی ئەم ئایەتانەدا هاتوە کە، سەحابەیەك کە ناوی قەتادە بو دەڵێت مامێکی هەبو هەندێك ئاردی کڕی بو لە ژێری ئاردەکەدا چەكو زرێو شمشێرێکی شاردبویەوە شەو دزرا، ئینجا لە ناو خەڵکا تەحقیقمان کردو بۆمان دەرکەوت کە بنەماڵەیەك ئەوەیان کردوە بە ناوی خێڵی ئۆبەیریق مەشهور بون بەکەم دەستی مامەکەشم وتی: حەز دەکەم ئەم شتە راگەیەنیت بە پێغەمبەرﷺ منیش چوومە خزمەت پێغەمبەری خواﷺو عەرزم کرد کە مامم شتێکی ئاوەهای بە سەر هاتوە کە هەندێك ئاردی کڕیوە و چەك زرێو شمشێریشی لە ژێر ئاردەکەدا داناوەو شەو هاتوون کونێکیان کردوەتە کەنوی ئاردەکەو هەرچی تێدا بوە بردویانە، ئێستا گومانمان هەیە لە سەر ماڵێك کە لە خێڵی "بەنو ئۆبەیریق"ە جا بفەرموە با چەکەکەمان بدەنەوە ئیتر ئەوەی تر هەمو بۆ خۆیان

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: { سأمُرُ ذِلكَ/ الترمذي، حسنه الالبا / بەم زوانە پرسو رایەك دەكەم لەو بارەوە} كە بەنو ئۆبەیریق ئەوەیان زانی هاتنە لای پیاوێكی ماقوڵی خۆیانو لەو بارەوە قسەیان كردو هاتنە سەر ئەوە كە هەندێك لەو بەرە بابە بچنە لای پێغەمبەرﷺو بڵێن: بەراستی قەتادەی كوڕی نوعمانو مامی دەیانەوێت خانەوادەیەكی چاكو پاكی ئێمە ناشرین بكەن هەروا بێ شایەتو بەڵگە بە دزی تاوانباریان دەكەن، قەتادە دەڵێ هاتمە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو فەرموی: ئەتەوێ خانەوادەیەك كە باسی ئیسلامیو چاكییان كراوە تاوانباریان بكەیت بە دزی بەبێ شایەت وبەبێ بەڵگە؟ قەتادە دەڵێت: گەڕامەوەو ئاواتم خواست كە هەندێ لە ماڵم لە ناو بچوایەو لەو بارەوە قسەم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نەكردایەو مامم پێم گەیشتو وتی برازا چیت كرد؟ منیش ئەوەی كە پێغەمبەرﷺ فەرموی پێم وت وتی: (ا ا ستعان) هەرخوایە داوای یارمەتی لێ دەكرێت زۆری پێ نەچو قورئان دابەزیو راستی قەتادەی سەلماندو ئەوانی بەدرۆ خستەوەو داوای لە پێغەمبەرﷺ كرد كە پاڵپشتی ئەو خیانەتكارانە نەكاتو داوای لێ خۆشبون بكات لە خوا. ئینجادەفەرموێ:

(١٠٧) تۆ بگرەو بەردە مەكە لە بارەی ئەو كەسانەی كە خیانەتیان كردووە لە نەفسی خۆیانو دزیان كردوە بەراستی خوا هەرگیز مرۆڤی خائینو گوناهباری خۆش ناوێت. كە ئەو كۆمەڵەش خائینو گۆناهبارنو حەق نیە پاڵپشتیو داكۆكیان لە سەر بكرێت.

(١٠٨) شتەكان دەشارنەوە لە خەڵك چونكە شەرم دەكەن لەحاڵێكدا كە ناتوانن لەﷲ ی بشارنەوە چونكە ئەو لەگەڵیاندا یەو هیچی لێ پەنهان ناكرێت كە شەو دائەنیشن قسەی وا دەكەن كە خوا رازی نیە بەو قسەیە، وە خوا گەمارۆی كارو باری ئەوانی داوە. واتە هەموو ئیشەكانی ئەوان لە ژێر دەستی خوادایەو خوا پێی دەزانێتو ئەوان لە ژێر زانیاری ﷲدەر ناچن.

(١٠٩) ئاگاداربن ئێوە واداكۆكیشتان كرد لە وان لە دنیادا ئەی رۆژی قیامەت كێ دیفاعیان لێ دەكاتو پاكانە یان بۆ دەكات؟ یان كێ هەیە پاڵ پشتو چاو دێر بێت بۆئەوان؟ بەم شێوەیە دەركەوت كە ئەو كۆمەڵەی كە تاوانبار كران بەڵێ راستبوكە دزییان كردبو، ئەوسا پێغەمبەرمانﷺ كتێبێكی حەقی بۆهاتووە دەبێ گوێ بگرێت لە هەردوو لا، ئینجا بۆی هەیە حوكم بكات ئێستا كەبەتەنیای گوێی لە مانە گرتوە ﷲ ئاوەها سەرزەنشتی دەكات، چونكە ﷲ خۆی حەقەو حەقیش ناشارێتەوە.

(١١٠) جا هەركەسێك ئیشێكی خراپ بكات یان زوڵم بكات لە نەفسی خۆیو تاوان بكات پاشان لە ﷲداوای لێ خۆشبوون بكات دەبینێ كەﷲ چاوپۆشی كەرو بەبەزەییە. ئەمەش مژدەیەكی خۆشە بۆموسڵمانان بەگشتیو بۆ ئەو كۆمەڵەش بە تایبەت.

(١١١) هەركەسێك گوناهێك بكات ئەوسا ئەوگوناهە زیانی بۆخۆیەتیو پێش هەموكەس خۆی گرفتار دەبێت بەراستی ﷲ زانەرەو ئیشەكانشی بەحیكمەتە. جا ئەگەر كەسێكی تر هۆ نەبێ تێیدا ئەوە هەرخۆی تاوانبارە. وەئەگەر كەسێكی تر هۆی تاوانەكەی بو باری ئەم سوك نابێت ئەمە هەر لە سەر تاوانەكەی خۆیەتیو مافی سزای خۆی هەیەو ئەوەیش كە هۆیە ئەویش تۆڵەی خۆی هەیەو ئەگەر بەر عەفواتی پەروەردگاری نەكەوێت لێی دەسەندرێت .

(١١٢) هەر كەسێك خۆی هەڵەیەك بكات یان گوناهێك بكات لە پاشان ئەو هەڵەو گوناهە بدات بەسەر كەسێكی تردا كەدوربێ لەو تاوانەو ئاگای لێ نەبێ ئەوسا بەراستی ئەو مرۆڤە بارێك بوهتانو گوناهێكی ئاشكرای لە سەرخۆی باركردوە.

وشەی (بهتان) واتەسەرسامبون، واتە ئەوقسە هەڵبەسراوە چونكە هیچ بنمایەكی نیەو قسە بۆ هەڵبەستراوە سەرگەردانو سەرسام دەبێت.

(١١٣) ئەی محمدﷺ ئەگەر زیادەو فەزڵو لۆتفی خوا نەبوایە بۆ تۆ خەریك بوو تاقمێك تۆ گومڕا بكەنو لاتدەن لە حەقو راستی، بەڵام چونكە لوتفی خوا لە گەل تۆدا بوو ئەوان هەرخۆیانیان گومڕا كرد، وەتەنها سەریان لە خۆیان شێواند و هیچ زیانێك بە تۆ ناگەیەنن، چونكە تۆ بەڕواڵەت حوكم دەكەیو ئەوانیش بە رواڵەت هاتنو دیفاعیان لێ كردو قسەكانیان پەسەندبو لەلات ئەگەر حوكمەكەیشت بكردایە تۆ تاوانت نەدەبو، بەراستی خوا كتێبی رەوانە كردوەتە لای تۆو دانایو ژیریشی پێداویتو ئەوەی كە نەتزانیوە لەپێشدا فێری كردیتو بەهرەو زیادەی خوا لە سەر تۆ گەورەیە. ئەمەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێت كە پێغەمبەران ماوەی ئیجتیهادیان پێ دراوە بەڵام پێغەمبەران ئەگەر لەو ئیجتیهادەیان دا نەیان پێكا بێت خوا ئاگاداری كردونەتەوەو راستیەكەی پێ فەرمونو لەسەر ئەو ئیجتیهادە هەڵە نەماون، ئەمە بەسودە بیزانە. ئینجا ﷲ تەمێمان دەكاتودەفەرموێ:

(١١٤) لە زۆربەی چپەكانیاندا هیچ خێرێكی تێدانییە مەگەر چپەكانیان بۆ یەكێك لەم سێ شتەبێت: یەكەم - مەگەر فەرمانبدات بەچاكەكردن. دووهەم - فەرماندان بە ئیشی باشو خێر، سێهەم - بۆ ناوبژیوچاك كردنی كاروباری خەڵك، هەر

۞ لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ ۚ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ الرَّسُولَ مِن بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ الْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ الْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِ جَهَنَّمَ ۖ وَسَاءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِ إِلَّا إِنَاثًا وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَانًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ اللَّهُ ۘ وَقَالَ لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمْ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ آذَانَ الْأَنْعَامِ وَلَآمُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَّخِذِ الشَّيْطَانَ وَلِيًّا مِّن دُونِ اللَّهِ فَقَدْ خَسِرَ خُسْرَانًا مُّبِينًا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمْ وَيُمَنِّيهِمْ ۖ وَمَا يَعِدُهُمُ الشَّيْطَانُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾ أُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنْهَا مَحِيصًا ﴿١٢١﴾

کەسێك ئەو چەفەیە لە بەر خاتری ڕەزای خواو تەنها بۆ ئەوە بێت کە خوا لە خۆی ڕازی بکات ئەوە بەم زوانە پاداشتێکی گەورەی پێ دەدرێت. لە مبارەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {إذا كانُوا ثَلاثَةٌ فَلا يَتَناجَى اثْنانِ دُونَ الثّالِثِ/البخاري/ ئەگەر سێ نەفەر بن بادوانیان چەفە نەکەن بێ سێهەمیان} چونکە دوانیان کە چەفە بکەن ئەوی تر وا گومان دەبات کە قسە لەبارەی ئەوەوە دەکرێتو دڵی نارەحەت دەبێت لە بەر ئەوە ئیجازە نیە، بەڵام ئەگەر زیاتر لە سێ نەفەر بون چەفە بکەن بەو مەرجەی چەفەکان لەو سێ شتەی کە باسمان کرد دەرنەچێت قەیناکە بەڵام ئەگەر لەم سێ شتە دەرچو هەر کاتێك بێت هەر خراپە.

(١١٥) ئەو کەسەی کەپاش ئەوەی کە حەقیقەتی بۆ ڕۆشن بوبەوەو ڕێگای هیدایەتی بۆ ئاشکرا بوو موخالفەتی پێغەمبەر ﷺ بکاتو پەیرەوی ڕێگای بێجگە لە باوەڕداران بکات ئێمەیش دەیبەین بەو ڕێگایەی کە خۆی دەیەوێت ودەیخەینە دۆزەخەوە، ئای چ جێگایەکی خراپە ئەو دۆزەخە. واتە هەوساری خۆی دەدەینە دەستی خۆیو هەرچی دەکات با بیکات. وەك ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا زَاغُوا أَزَاغَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ ﴾ /الصف:٥ / کاتێك کە ئەوان لایان دا لە حەق، الله یش دڵی ئەوانی لادا. ئەمەش ئەوە دەردەخات کە موسڵمانان پێویستە هەمیشە ئاگایان لە خۆیان هەبێو موخالەفەتی کۆمەڵی موسڵمانی ڕاستەقینە نەکەن، ئەگەر کردیان ئاوەهایان لێ دێت وەك لەم فەرمودەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {.... يَدُ اللهِ مَعَ الجَمَاعَةِ / الترمذی، صحح الالبا / دەستی خوا لە تەك کۆمەڵدایە}.

(١١٦) الله خۆش نابێت لەوەی کە هاوبەشی بۆ دابنرێت بەڵام الله خۆش دەبێت لەو گوناهانەی کەلەوبەرەوخوارتربێت بۆ هەر کەسێك کە ئارەزۆی لێ بێت، وە ئەو کەسەی کە هاوبەش دابنێت بۆ خوا بەراستی گومڕا بوە بە گومڕاهیییەکی دوور لە ڕاستی وا کە دورە جارێکی تر بگەڕێتەوە سەر ڕێگای ڕاست.

(١١٧) ئەوانە جگە لە الله هەرچی دەپەرستن ناوی مێینەیان لەسەرە (لات، عزا، مناة) وە ئێوە هەر داوا لە شەیتانێك دەکەن کە سەرکەشو خراپە کێڵە؟! وتراوە لە گەڵ هەمو بتێکدا جنۆکەیەکی مێ هەبوە.

(١١٨) الله لەعنەتی لەوشەیتانە کردوەو ئەویش سوێندی بە عزەتی خوا خواردوەو وتویەتی کە بەشێکی براوە لە بەندەکانت وەردەگرم بۆ خۆمو وەك خۆم لاڕێیان دەکەم.

(١١٩) سوێند بە گەورەیت گومڕایان دەکەم، وە سوێند بە تۆ ئەوەندە ئاواتیان ئەخەمە بەر چاو تا تۆیان نەکەوێتە بیرەوە، نەك تەوبە بکەن، پێیان دەڵێت ئێستا پەلە مەکەو تەوبە مەکە ئەو گوناهە هیچ نیەو تۆ باشتری لە فلانە کەس. ....هتد ئابەو جۆرە شتانە دەسەڵاتو هێزی خوایان لە بیر ئەباتەوە. وەسوێند بە تۆ ئەمریان پێ دەکەم هەتا گوێی مەڕو ماڵاتەکانیان شەق بکەن بۆ دیاری کردن بۆ بتەکانیان، وە سوێند بە تۆ فەرمانیان پێ دەکەم کە دروستکراوەکانی الله بگۆڕن کە خاڵ کوتانو خەساندنی حەیوانی نێرو برۆ هەڵگرتنو ڕیش تاشینو هەر جۆرە گۆڕان بۆ دروستکراوەکانی خوا تاوانەو فەرمانی شەیتانەو خوا بەو جۆرە ڕەفتارانە عاجزەو هەر کەسێ دەستیان لێ نەکێشێتەوە تاوانبارەو مافی سزادانی هەیە بەڵێ الله موی سەری پێداوین وە ڕیشو سمێڵیشی پێ داوین کەئەم دوانە دراوە بە پیاو نەك بە ئافرەت وە ئەو موانە کەالله پێ داوین پێویستە لە سەرمان کە نەیگۆڕین مەگەر شەرع خۆی حوکمەمان بۆ بکات کە چۆن بیگۆڕین بۆ نمونە بۆ سەر فەرمویەتی: بیتاشن یان کورتی کەنەوە کەواتە بۆ پیاو ئیجازەی پێ دان کە سەر بیتاشن یان کورتی بکەینەوە، ئینجا بۆ سمێڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: هەڵکێشاندن، تاشین، کورت کردنە وە کە سێهەمیان چاکتریانە، بەڵام بۆ ڕیش فەرمویەتی: {إعفاءُ اللحية/ واز لە ڕیش بهێنن} وە بۆ موی شەرمگە فەرمویەتی بیتاشنو موی بن باڵ هەڵکێشن. بەڵێ ئەمانە دروستکراوی خودانو کەس مافی ئەوەی نیە دەستکاریان بکات مەگەر بەو شێوەیەی کە بۆی دیاری کردوین،

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴿١٢٢﴾ لَّيۡسَ بِأَمَانِيِّكُمۡ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِۗ مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ﴿١٢٤﴾ وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحۡسِنٞ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٖ مُّحِيطٗا ﴿١٢٦﴾ وَيَسۡتَفۡتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرۡغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ﴿١٢٧﴾

بەڵام ئەوەتە شەیتان زاڵ بوە بە سەر زۆربەمانداو سەر شۆڕو شەرمەندەی خواو پێغەمبەرو ڕۆژی قیامەتی کردوین، برایانو خۆشکانی خوا ناس ئەو دروستکراوەی خوا زۆر زۆرجوانترو کەم ئەرکترە تا ئەو دەسکاریەی خۆتان، لە خوا بترسنو دوژمنی بێ بەزەیی‌و رق لە دڵی خۆتان کە شەیتانە رازی مەکەن وپەیڕەوی مەکەن چونکە خوا دەفەرموێ: خۆ ئەو کەسەی کە شەیتان بکات بە دۆست بۆ خۆی بێجگە لە خوا ئەوسا بەڕاستی ئەوە زیانی کردوە بە زیانێکی ئاشکرا. وتراوە دوژمن ئەگەر ئامۆژگاری کردیت لەو ئامۆژگاریە بترسە، ئینجا ﷲزیاتر ڕەفتارەکانی شەیتان سەبارەت بە نەوەی ئادەم ڕۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿١٢٠﴾ شەیتان بەڵێنیان پێ دەداتو دەیانخاتە ناو دەریای ئارەزۆو ئاوات خواستنەوە لەکاتێکدا کەئەو بەڵێنانەی شەیتانیش تەنها دەستخەڕە کردنو سەر لێ تێك دانەو هیچی تر. دەی ئایا ڕەوایە مرۆڤی ژیر دوژمنی وا بکات بە دۆستی خۆی؟ جا ﷲ دەفەرموێ

﴿١٢١﴾ ئەوانە شوێنیان جەهەنەمەو جگە لەو جێگایە هیچ پەناگایەکیان دەست ناکەوێت کە خۆیانی تێدا بشارنەوە تا رزگاریان ببێت لەو تۆڵەو سزایە. ئینجا ﷲ باسی باوەڕ دارانمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٢٢﴾ وە ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە بەم زوانە دەیانخەینە بەهەشتانێکەوە کە لە ژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگە دەڕوات کەئەوانیش بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە لە ناو ئەو نازو نیعمەتانەداو ناترسن لەوەی کە رۆژێك لە ڕۆژان دوایی بێت ئەمە بەڵێنی خوایەو بەڵێنی خواش ڕاستە، وە کێ هەیە لە خوا قسە ڕاستر بێت؟ بەڵێ دەبێ ئەوە بزانین کە ئایین‌و خواناسین وگەورەی مرۆڤ لای پەروەردگاری بە ئاواتو ئارەزۆ نیە بەڵکو پێویست بە ئیش‌و تەلاش دەکات، ئەوەتە ﷲ دەفەرموێ:

﴿١٢٣﴾ نە بە ئاواتی ئێوەیە ئەی موسڵمانان وە نە بە ئاواتی ئەهلی کتێبە، هەر کەسێك خراپە بکات بە دڵنیاییەوە سزای خۆی پێ دەدرێتەوە لە سەر ئەو خراپەیە، وە بێجگە لە خوا هیچ دۆستو یاریدەدەرێکی تری دەست ناکەوێت. ئەمە لە سەر ئەوە دابەزی کە ئەهلی کتێب دەیان وت: دینەکەی ئێمە لە دینەکەی ئێوە چاکترە، چونکە پێغەمبەری ئێمە پێش پێغەمبەری ئێوە بووەو کتێبی ئێمە پێش کتێبەکەی ئێوە بوە کەوا بو دینی ئێمە لە دینی ئێوە چاکترەو موسڵمانەکان دەیانوت: ئێمە چاکترین لە ئێوە پێغەمبەری ئێمە دواترین پێغەمبەرەو کتێبەکەمان دواترین کتێبە کە هاتووەو حوکم دەکات بە سەر تەواوی کتێبەکانی تردا، ﷲدەفەرموێ: بە پێغەمبەرەکەتان نیەو بە کردارەکەی خۆتانە، دەڵێن: کاتێك کە ئەم ئایەتە دابەزی ئەبوبەکر هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و وتی: توندترین هەڕەشە ئەم ئایەتەیە هەر ئیشێکی خراپمان کردبێت تۆڵەمان لێ دەسەنرێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: {غَفَرَ اللهُ لَكَ يَا أَبَا بَكْرٍ أَلَسْتَ تَمْرَضُ أَلَسْتَ تَنْصَبُ أَلَسْتَ تَحْزَنُ أَلَسْتَ تُصِيبُكَ اللأْوَاءُ قَالَ بَلَى قَالَ فَهُوَ مَا تُجْزَوْنَ بِهِ / ا د، صحح الالبا / خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبوبەکر ئایا نەخۆش ناکەویت؟ ئایا ماندو نابیت؟ ئایا خەمبار نابیت؟ ئایا توشی سەختی‌و نارەحەتی نابیت؟ ئەبوبەکر وتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەو تۆڵەی ئەو تاوانانەیە لێت وەرئەگرێت واتە مەرج نیە مرۆڤ ئەگەر هەر گوناهێکی کرد دەبێ چەندین ساڵ لە ناو ئاگری جەهەنم دا بسوتێت جاری وا هەیە کابرا گوناهێکی کردوە بەڵام لە ڕۆیشتنا درکێك دەچێ بە پێیداو دەبێ بە هۆی سڕینەوەی گوناهەکەی‌و ئەمەش فەزڵو ڕەحمەتی خوایە بەرامبەر بە مرۆڤەکان. ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٢٤﴾ هەر کەسێك لە ئیشە چاکەکان ئەنجام بدات چ نێر بێت یا مێ لەحاڵێکدا کە ئەو باوەڕدار بێت ئەوسا ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتەوەو بە ئەندازەی چاڵە بچوکەکەی دنکی ناوخورما ستەمیان لێ ناکرێت.

وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحٗاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞۗ وَأُحۡضِرَتِ ٱلۡأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلۡمَيۡلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلۡمُعَلَّقَةِۚ وَإِن تُصۡلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغۡنِ ٱللَّهُ كُلّٗا مِّن سَعَتِهِۦۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمٗا ﴿١٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ وَصَّيۡنَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَإِيَّاكُمۡ أَنِ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدٗا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرٗا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ﴿١٣٤﴾

(١٢٥) کێ هەیە چاکتر بێت لە بارەی دینەوە لەو کەسەی کە بە تەواوی خۆی تەسلیمی اللَّهُ بکات لەگەڵ ئەوەشدا چاکەکار بێتو هەمیشە عیبادەتی خوا وابکات وەك خوا ببینێتو دوای ئاینی ئەو ئیبراهیمە بکەوێت کە لە هەمو ناڕەوایەك لای دا بوو پەیرەوی راستی بو، وە خوای گەورەش ئیبراهیمی بە خۆشەویستی خۆی داناوە بەڵێ ئایینی ئیبراهیم هەمان ئایینە کە هاتوە بۆ پێغەمبەرمانﷺ وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾ آل عمران: ٦٨ /نزیکترین کەس بە ئیبراهیم ئەو کەسانەن کە لەکاتی خۆیدا دوای کەوتوونو ئەم پێغەمبەرەیەو ئەو کەسانەن کە پەیرەوی ئەم پێغەمبەرن ﷺ ، وە خوا دۆستو یارمەتی دەری خاوەن باوەڕانە﴾.

(١٢٦) هەرچی لە ئاسمانانو زەوی دایە موڵکی خوایە، وە خوداش گەمارۆی هەموو شتێکی داوەو هیچ شتێك لە دەسەڵاتو عیلم وزانایی ئەو دەرناچێت.

(١٢٧) وە لە بارەی ئافرەتانەوە پرسیارت لێ دەکەن بڵێ: خوا فتواتان بۆ دەدات لە بارەیانەوە، ئەویش ئەمەیە کە لەم کتێبەدا دەخوێندرێتەوە بە سەرتاندا کە بریتیە لەوەی کە لە بارەی ئەو هەتیوە ئافرەتانەی کە ئێوە ئەوەی فەرز کراوە بۆیان لە مارەیی پێیان نادەنو دەتانەوێت کە نیکاحیشیان بکەن، یان ناهێڵن مێرد بکەن، ئەوانەی کەلەپێشدا باسکرانو ئەوانەیش کە لەمەودوایاس دەکرێن نابێ ستەمیان لەگەڵدا بکرێتو مافیان پێشێل بکرێتو وئەوانەش کە لاوازن لە منداڵان، وە پێویستە ئێوە دادگەرانە لە گەڵ ئەو هەتیوانە دا بجوڵێنەوە، وە هەر چاکەیەك بکەن با دڵنیا بن کە خوا زانایە پێیو پاداشتی بە چاکتر لە خۆی دەداتەوە. لە سەردەمی نەفامیدا پیاوێك کە هەتیوێکی ئافرەتی لابوایە لیباسێکی خۆی بدایە بە سەریا ئیتر هیچ کەس نەی دەتوانی نیکاحی بکات وبیخوازێت جا ئەگەر جوان بوایەو حەزی لێ بکردایە ئەوە دەیخوازیو هەمو ماڵەکەی دەخوارد، وە ئەگەر ناشیرین بوایە نەیدەدا بە شوو هەتا دەمردو هەرکاتێکیش دەمرد ماڵەکەی بە میرات دەبرد، ئینجا اللَّهُ بەرگری کردن لەو تاوانە سەبارەت بە هەتیوانو داوای لێ کردن کە بە جوانی رەفتار بکەن لە گەڵ ئافرەتانو منالانو هەتیوان داو چاکەیان لە گەڵدا بکەن. ئینجا اللَّهُ باسی حوکمێکی ترمان بۆ دەکات سەبارەت بەو پیاوانەی کە لە گەڵ خێزانیان بە چاکی رەفتار ناکەن وەکو چۆن لە پێشەوە باسی ئەو ئافرەتانەی کرد کە خراپە لە گەڵ مێردەکەیان دەکەنو گوێ لە بڕیارو قسەکانیان شل ناکەن، دەفەرموێ:

(١٢٨) جا ئەگەر ئافرەتێك ترسا لە ستەمی پیاوەکەی یان گوێی پێ نەدا لە خەرجیو جێگاو مافی خۆی پێ نەدات ئەوە گوناح نیە کە ئاشتیان بکەنەوە چونکە هەر ئاشتی چاکە، ئاشتی کردن لە گەڵ حوکم کردندا ئەو جیاوازیەی هەیە کە لە ئاشتی دا بۆرێك کەوتنیان دەتوانرێت زیادو کەم بکرێت لە مافی پیاوو ژنەکەدا، بەڵام حوکم هیچ جیاوازیەك ناکاتو هەرکام چەندێك مافیان ببێت هەر ئەوەندە یان پێ دەدات ماوە بە زیادو کەم کردنی مافی هیچ کەسێك نادرێت. خۆ هەمومرۆڤیش تەماعی هەیەو هەمو کەسێك ماڵی پێخۆشە جائەگەر ئێوەی پیاوی چاکە بکەنو هەندێ چاوپۆشی لەماڵی خۆتان بکەن بۆئافرەتەکانتانو لە خوا بترسن ئاشتەواییەکە زووتروچاکتر دەکرێت، ئەوسا بەبێگومان کەاللَّهُ بەوەی کە ئێوە دەیکەن ئاگادارەو پاداشتی چاکەکانتان دەداتەوە. خۆ ئەگەر ئافرەتەکەیش هەندێ لە ماڵی خۆی بەخشی بە مێردەکەی بۆ ئەوەی مێردەکەی رازی ببێت،ئەویش هەرچاکەو مەبەست ئاشتەواییە. لە پێشدا فەرموی دەبێ بە دادگەرانە رەفتار بکەن لە نێوان ئافرەتان دا و هەر کەسێك چەند خێزانی ببێت دەبێ دادگەر بێت لە نێوانیان دا، بەڵام ئەوە مەبەستی خۆشەویستی ناو دڵ نیە وەك دەفەرموێ:

(١٢٩) هەرگیز ئێوە ناتوانن کە دادپەروەر بن لە نێوان ژنەکانتان هەرچەندە خۆتان زۆر سووریش بن لە سەری، چونکە ئەوە

شتێکی ناودەرونیەو بەسراوە بە رەفتاری ئافرەتەکانەوە جا کامیان جوانتر رەفتار بکات ئەویان خۆشەویستترە لە دڵی مێردەکەیداو بەو خۆشەویستیە زیاترە مێردەکەیان تاوانبار نابێت، بەڵام نابێ ئەم خۆشەویستی ناو دەرونیە ببێت بە هۆی فەرقو جیاوازیان لە خۆراك وپۆشاكو جێگاداو لە ژمارەی ئەو شەوانەی کە لە گەڵیاندا دەبن. هەندێك بە هەڵە ئەم ئایەتە دەکەن بە بەڵگە لە سەر دروست نەبونی زیاتر لە ژنێك، چونکە دەڵێن خوا زیاتر لە ژنێکی بەستوە بە دادپەرەریەوە **(العدالة)** وە لەم ئایەتەشدا دەفەرموێ: کەس ناتوانێت کە دادپەروەری بپارێزێت، کەوا بوو نابێ زیاتر لە ژنێك بهێنێت. بەڵام لە راستی دا کردارو وتارو دان پێدانانی راستەو دروستی پێغەمبەرمانﷺ ئەو مانایە هەڵ دەوەشێنێتەوە مەبەست خۆشەویستی ناو دەرونەو ناتوانرێت بگورێت بۆیە وا بە دوای ئەوە دا دەفەرموێ: جا بە تەواوی مەیل نەکەن بەلای هەندێکیانداو ئەوانیتریان واز لێ بهێنن وەك هەڵبەسراوێك کە ئافرەتەکە نە شودار بێتو نە بێ شوو، وە ئەگەر ئێوە ئاشتی و ئیشی چاك بکەنو لە خوا بترسن ئەوسا دڵنیابن کە ﷲ لێبوردەو میهرەبانە بەرامبەر بە بەندەکانی. جا ئەگەر هەر نەگونجانو ئاشتیان نەکردو رێك نەدەکەوتن خوا دەفەرموێ:

(١٣٠) خۆئەگەر هاتو لە یەك جیا بونەوە ﷲ هەردووکیان لەو فرەوانیو نیعمەتە زۆرەی کە هەیەتی بێ نیازیان دەکات واتە دوای ئەو هەمو هەوڵو کۆششەو رێك نەکەوتنیان، ئینجا بەرەو لێك جیا بوونەوە هەڵیان دەنێتو دەفەرموێ: لە رۆزی مەترسن و ﷲ نیعمەتەکانی فرەوانەو ئیشەکانیشی بە حیکمەتە ئاوەها بریاری داوەو نابێ لەو بریارانەی لابدەن، چونکە لادان لە دانایی، نەزانیو نەفامیەو بێجگە لە شەرمەندەییو سەر شۆڕی شتێکی تر نیە. پاشان پەروەدگاری داناوکاربەجێ بەرەو دەسەڵاتو هێزی خۆی سرنجمان رادەکێشێتو دەفەرموێ:

(١٣١) خۆ ئەوەی لە ئاسمانانو زەویدایە هەموی موڵکی خوایەو خوا خاوەنیەتی، وە بەراستی ئێمە ئامۆژگاریمان کردوە بۆ ئەوانەی کە کتێبمان پێ داون لە پێش ئێوەدا، وە بۆ ئێوەش کە لە ﷲ بترسنو خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە ببێت بە هۆی رقو سزای ﷲ، وە ئەگەر ئێوە بێباوەڕ ببن سا چاك بزانن بە بێگومان ئەوەی کە لەناو ئاسمانانو زەویدایە هەموی موڵکی خوایە و ﷲ بە سەرپێچی نەوەی ئادەم لە فەرمانەکانی هیچ زیانێکی پێ ناگات، بەڵکو تەنها هەرخۆیان رەنجەڕۆو خەسارەت مەندن، ئەوەتە دەفەرموێ: وە خوا دەوڵەمەندەو سوپاسکراوە ئیتر ئێوە ئەی نەوەی ئادەم وا بیر نەکەنەوە کە داواکاری خوا لە ئێوە

۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا (١٣٥) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا (١٣٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا (١٣٧) بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا (١٣٨) ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا (١٣٩) وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُواْ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا (١٤٠)

بەڵگەی نیازی خوایە بە ئێوە نەخێر خوا هیچ ئیشێکی پەکی ناکەوێت لەسەر ناشوکریو تاوانی ئێوە.

(١٣٢) ئەوسا هەر بۆ خوایە ئەوەی کە لەناو ئاسمانانو زەوی دایەو بەسە کە ﷲچاودێرو پشتیوانی مرۆڤ بێت. ئاشکرایە پاش ئەم هەمو ئامۆژگاریو لوتف نواندنەی ئەگەر سەرپێچی بکرێت زۆر شتێکی پەسەندو بەجێیە کە تۆڵەی سەخت وەرگرێت لە تاوانبارانو توانایشی هەیە وەك دەفەرموێ:

(١٣٣) ئەی خەڵکینە ئەگەر ﷲ بییەوێت لە ناوتان دەباتو خەڵکێکی تر دێنێتە جێتان، وە ﷲ بەسەر ئەوەدا زۆر بەتوانایەو هیچ هێزێکیش نیە کە بتوانێت بەرەنگاری بکاتو لە ئیشەکانی دوای بخات. دەی ئایا ئەمە بەس نیە بۆ ئێمەی موسڵمان کە بە چاکی خۆمان بپارێزین لە تاوانکاریو ئیشی خراپ نەك ﷲ عاجز ببێت لێمانو لە ناومان ببات؟

(١٣٤) ئەو کەسەی کە پاداشتی دنیایی مەبەستە بۆ ئیشەکانی خۆی بادڵنیابێت هەر لەلای ﷲ یە پاداشتی دنیاو قیامەت، کەواتە تەنها روبکەرە ئەو زاتە، وە ﷲ بیسەرو بینەرە بەو وتارو ئیشانەی کە ئێوە دەی کەن. دەی هەرﷲ بپەرستە پاداشتی دنیاو قیامەتت دەست دەکەوێت.

(١٣٥) ئەی خاوەن باوەڕان ئێوە هەمیشە بە دادپەروەرانە حوکم بکەن، لەبەر خوداش شایەتی بدەن ئەگەر چی ئەو شایەتیە زیانی

خۆتان یان زیانی دایك وباوكتانو خزمانی تێدا بێت ئەگەر چی ئەوشایەتی لەسەردراوە دەوڵەمەند بێ یان فەقیر ، هەر ﷲ شایستەترەو پێویست ترە پێش ئەوانی بخەیت وفەرمانی جێبەجێ بكەیت جا دوای ئارەزۆات نەكەون كە دادگەرانە نەجوڵێنەوە بەڵكو دەبێ دادگەر بن، وە ئەگەر ئێوە زمانتان گۆڕی لە شایەتی دا یان شایەتیتان نەدا ئەوسا بێگومان ﷲ بەوەی كە ئێوە دەیكەن ئاگادارە. ئەمە هەڕەشەیەكی توندە تا دادپەروەر بنو زمان نەگۆڕن،وە لە شایەتی دا خۆتان كەنار نەدەن. ئینجا بە وەسفی باوەڕدار بانگمان دەكاتو دەفەرموێ:

(١٣٦) ئەی خاوەن باوەڕان ئیمان بهێننو بەردەوامبن لە سەر باوەڕی راستەقینە جا نابێ هیچ گومانێك لە ناو دڵتاندا هەبێو پێویستە هەمیشە ئەو باوەڕەی خۆتان تازە بكەنەوە، باوەڕ بهێنن بە خواو بە نێرراوەكەیو بەو كتێبەی كە رەوانەی كردوە بۆ نێرراوی خۆی كە قورئانەو بەو كتێبەش كە لە پێشدا رەوانەی كردوە، وە هەر كەسێك بێباوەڕ بێت بە خواو بە فریشتەكانیو بە كتێبەكانیو بە پێغەمبەرەكانیو بەرۆژی دوایی بەراستی ئەو كەسە گومڕا بوە بە گومڕاییەكی دوور لە راستی. وە خوای گەورە تاكو تەنیایەو ئیحتاجی بە كەس نیەو هەمو مرۆڤەكان موحتاجن بە ئەو، وە ئەوەی كە سیفەتی جەماڵو كەماڵە هەموی لەودا هەیەو هیچ كەمو كوریەك نە لە زاتیداو نە لە سیفاتی داونەلەكرداریدا نەبوەو نییەو نا بێتو فریشتەكانیش كۆمەڵێكن كە ﷲدروستی كردوون هیچ كاتێك لە زیكری ئەو بێ ئاگا نینو دروستكراوێكی زۆر زۆرنو جێگای چوار ئەنگوست لەو ئاسمانەی خۆماندا نیە مەگەر فریشتەیەكی بە سەرەوەیەو خەریكی بەندایەتی خوایەو مەئموری باو بارانو گیاندارو بێ گیانو بەهەشتو جەهەنەمو مەرگو ژیانن، كە دەچنە سەر هەمو شێوەیەكەوە بێجگە لە شێوەی سەگو بەراز نەبێت، وە كتێبەكانیش بریتین لە (تەوراتو ئینجیلو زەبورو سوحوف) كە بۆ پێغەمبەرەكانی پێشوو هاتوونو قورئانیش بۆ پێغەمبەرمانﷺ هاتوە، وە هەمو پێغەمبەرەكان (سەلامی خوایان لێبێ) وەك یەكن لە پێغەمبەرایەتی داو هەمویان راستنو خوا ناردونیو دەبێ باوەڕمان پێیان هەبێت بە بێ جیاوازی لە نێوان پێغەمبەرەكانداو پێنجیان بە خاوەنی شەریعەتی سەربەخۆو بەئولولعەزم ناودەبرێن كەبریتین لە( نوحو ئیبراهیمو موساو عیساومحمد سەلامی خوا لەهەمویان بێ)، وە دەبێ باوەڕمان بەرۆژی دوایی كە ئەو رۆژە مرۆڤەكان زیندوو دەكرێنەوە هەبێت و ئەم لەشەی كە ئێستا هەمانە وەكو خۆی لێ دەكرێتەوەو حیسابی مرۆڤەكان لە سەر كردەوەكانی دەكرێت ، وە دەبێ بزانین كە پردی سیرات هەیەو هەر كەس لەو پردە نەپەڕێتەوە بێگومان دەكەوێتە جەهەنەمەوەو دەبێ بزانین لە بەهەشتو جەهەنمدا مرۆڤەكان دەگۆڕێن بەهەشتی بەم شێوەیەن كە شەست مەتر باڵاو حەوت مەتر قایمیان هەیەو هەرچیان پێ خۆشبێت دەستیان دەكەویتو نە نەخۆشیو نە قسەی ناخۆشو نە پیسیو نەمیزو نە بەڵغەمو نە سەرەگێجەیان هەیەو جەهەنەمیەكانیش هەر دانێكیان بە ئەندازەی چیای ئوحودەو قایمایی پێستیان لەچل مەترەوە بۆ زیاتریش، خۆ وتراوەویشە لە سەعاتێكدا سەدو بیست جار لە ناو ئاگردا ئەو پێستەیان دەكولێتو پێستی تازەیان بۆ دروست دەكرێتو خواردنەوەیان زوخو كێمی جەهەنمیانەو بەزۆرئەوسا لە قوڕگیان دەچێتە خوارەوە، لیباسی ئاگریان لە بەر دایەو كەڕو كوێرن تا ناڵەی كەسی تر نەبیستن وچاویان بەكەس نەكەوێت تاوا بزانن كەهەرخۆیانن لەوسزادا جا بێباوەڕو دووڕو موشریك بۆ هەمیشە لە ناو ئەو سزا گەورە دا دەمێننەوە، نە تازە دەمرن تا رزگار ببن لەو سزایەو نە رزگاریان دەبێت لێی، ئینجا ﷲ سەبارەت بەو كەسانەی كە ئیمان لە دڵەكانیاندا بە تەواوی سەقامگیر نەبووە دەفەرموێ:

(١٣٧) بێگومان ئەوانەی كە باوەڕیان هێنا لە پاشان كافر بونەوە لە پاشان باوەڕیان هێنایەوە دیسان هەم كافر بونەوە ئینجا لە سەر كوفرەكەیان ڕۆیشتنو درێژەیان پێدا هەتا بە كافری مردن هەرگیز خوا لە گوناهیان خۆش نابێتو تازە ڕێگای خۆشبەختیشیان پێشان ناداتو لە ڕۆژی قیامەتدا رزگاریان نابێت.

(١٣٨) مژدە بدە بە مونافقان كە سزایەكی دەردناكیان بۆ هەیە. لەراستیدا ئەمە گاڵتە پێ كردنە چونكە موژدە بۆ شتی خۆشو بە سودە.

(١٣٩) مونافق ئەو كەسانەن كە بێباوەڕان دەكەن بە دۆست بۆ خۆیان لەباتی باوەڕداران، ئایا ئەوانە دەیانەوێت بە هۆی ئەو بێباوەڕانەوە گەورەیيو عیزەت بۆ خۆیان پەیدا بكەن؟ سابا بزانن هەرچی گەورەیيو دەسەڵات هەیە بۆ خوایەو هیچ كەس ناتوانێ كەسێك سەر بەرز بكات یان نزمی بكات مەگەر ﷲخۆی ئارەزۆی لێ بێت. بەڵام جێگای داخە كە ئەمڕۆ ئێمە بە سازی دوژمن هەڵدەپەڕینو چاوەڕێی دوژمنین كە بێت بە هاوارمانەوەو پارێزگاریمان لێ بكات بەراستی ئەگەر بیر نەكەینەوە زۆر زۆر خەڵەتاوینو هەرگیز لە سزای خوداش رزگارمان نابێت، پێویستە ئێمە گوێ لە قورئان بگرین.

(١٤٠) بەراستی لەم كتێبدا كە قورئانە رەوانەمان كردوەتەلاتان كە هەر كاتێك بیستتان كە بە ئایەتەكانی خوا كوفردەكرێتو گاڵتەی

پێ دەكرێت ئەوسا ئێوە نابێ لە گەڵیاندا دابنیشن هەتا دەچنە سەر باسێكی تر، واتە دەبێ بە جێیان بهێڵن‌و دوور بكەونەوە لێیان. چونكە ئەگەر هاتو لە گەڵیاندا دانیشتن بەبێگومان ئەو كاتە ئێوە وەك ئەوان حیسابتان بۆ دەكرێت. كاتێك كە دیتتان كەسێك گوناح‌و تاوانێكی كردو تۆ لە گەلی دا بێدەنگ دانیشتبوی بزانە كە حیسابی تۆش لە گەڵ ئەودا دەكرێت‌وتۆیش هاوبەشی لەو گوناهو تاوانە، ئەی تۆ باوەڕدار نیت ئەوە دژایەتی بیرو باوەڕو خوای تۆ نیە؟ چاك بزانە كە تۆ شەریكیت‌و لەم بارەیشەوە ئەم فەرمودەی پێغەمبەرمان ﷺ دەخەینە بەر چاو كە دەفەرموێ: {مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلَا يَقْعُدْ عَلَى مَائِدَةٍ يُدَارُ عَلَيْهَا الْخَمْرُ /النسائي، ا د، صححه الالبا / كەسێك كە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هەبێت هەرگیز لە سەر خواردنێك دانانیشێت كە شەرابی لە سەر دانرابێت} با خۆیشی نەیخواتەوە ئەوە فەرمودەی خواو پێغەمبەر بووﷺ جا تۆیش هەر بڵێ: من حەقم چیە؟! ئینجا دەفەرموێ: بەبێگومان كە ﷲ كۆكەرەوەی هەمو مونافقان‌و كافرانە لە جەهەنمدا. گاڵتە كردن بە ئایینی ﷲ كوفرەو ئەگەر پێشتر باوەڕداریش بێت بەو كوفرە لە بازنەی ئیمان دەردەچێت و ئەو كەسەیش كە بە مەیلی خۆی لەو شوێنەدا دادەنیشێت كە گاڵتە بە ئایینی خوا دەكرێت‌و بەرپەرچیان ناداتەوەو لای كەم بەجێیان ناهێڵێت ئەوە دیارە ئەوویش بەوە ڕازیە ئەگەرچی خۆیشی ئەو ئیشە نەكات جا ڕازی بوون بە كوفریش خۆی بۆخۆی كوفرە، بۆیە ئەوانە هەمویان یەك حیسابیان بۆ دەكرێت‌و هەردووكیان كافرن هەرچەند كابرای مونافق بە ڕواڵەت خۆی بە خاوەن باوەڕدابنێت‌و ئیدعای موسڵمانی بۆ خۆی بكات، كەواتە لە دنیادا ئاوا لەگەڵ كافران دا كۆ نەبنەوە تا خوا لە جەهەنمدا لەگەڵ ئەواندا كۆتان نەكاتەوە، ئینجا زیاتر مونافقانمان پێ دەناسێنێت‌و دەفەرموێ:

(١٤١) مونافق ئەوكەسانەن كە هەمیشە چاوەڕێی ڕۆژی ڕەش بۆئێوە دەكەن جا ئەگەر ئێوە لە لایەنی خواوە سەركەوتنێكتان دەست كەوت مونافقان: دەڵێن ئەدی ئێمە لە گەڵ ئێوەدا نەبووین؟ وە ئەگەر كافرەكان شتێكیان دەست بكەوتایە دەیانوت: ئایا ئێمە زاڵنەبوین بە سەر ئێوەدا؟ ئەوە ئێمە نەبوین كە نهێنیەكانی موسڵمانەكانمان بۆ دەهێنان‌و پێمان دەگوتن كە بۆ بەرەنگاربونەوەیان چی بكەن؟ وە ئێمەنەبوین كەرێگامان لەباوەڕداران دەگرت تادەستیان پێتان نەگات؟دەمان ترساندن‌و پڕو پاگەندەمان دژی ئەوان بڵاو دەكردەوەو ڕۆحیمان لاواز دەكردن؟ ئا بەم شێوەیە ﷲ مونافقان دەناسێنێت بە ئیمانداران‌و دەفەرموێ: ئەوسا چاك بزانن بەراستی ﷲ حوكم دەكات لە نێوانتاندا لە ڕۆژی قیامەتدا، وە كافران بە هیچ شێوەیەك بۆیان

ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمۡ فَإِن كَانَ لَكُمۡ فَتۡحٞ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَكُن مَّعَكُمۡ وَإِن كَانَ لِلۡكَٰفِرِينَ نَصِيبٞ قَالُوٓاْ أَلَمۡ نَسۡتَحۡوِذۡ عَلَيۡكُمۡ وَنَمۡنَعۡكُم مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ﴿١٤٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفۡعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمۡ إِن شَكَرۡتُمۡ وَءَامَنتُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمٗا ﴿١٤٧﴾

نییە خاوەنی دەسەڵات بن بە سەر موسڵمانان دا. وە ئەمە بڕیارێكی شەرعییە نە كەونی ، واتە لەشەریعەتی خوادا، دەسەڵاتی كافر بەسەر موسڵماناندا دروست نیە.

(١٤٢) بە بێگومان كە مونافقان دەیانەوێت فێڵ لە خوا بكەن، بەڵام ﷲ ئەوان دەخەڵەتێنێت، وە هەر كاتێ هەڵدەستن بۆ نوێژ بە شێوەیەكی تەمەڵانە هەڵدەستن، واتە مونافقەكان نوێژ دەكەن، بەڵام بە شێوەیەكی تەمەڵانەو لارە ملێ كەخۆیان پێشانی خەڵك دەدەن‌و دەیانەوێت كە خەڵك بیان بینێت تا بەو فێڵە جێگای خۆیان لە ناو ڕیزی موسڵمانان دا بكەنەوە، وە یادی خوا ناكەن مەگەر بە كەمی. لە ڕاستی دا وەسفی خوا بە فێڵباز بە ڕوتی دروست نیە، چونكە فێڵكردن بۆ كەسێكە كە توانایی نەبێ ڕاستەوخۆ ئەوەی ئارەزۆی لێیەتی بیكات بۆیە پەنا بۆ فێڵكردن دەبات، بەڵام ﷲ هەرچی ئارەزۆی لێ بێت دەیكات‌و كەس ناتوانێ ڕێگای لێ بگرێت‌و لە كەسیش ناترسێت ئەم وشەی (خدعە، مكر) ە لە بەر هاوشێوەیی ئیشی ئەوان فەرمویەتی، چونكە فێڵ ئەوەیە كابرای فێڵ لێكراو بە خۆی نازانێت تا ئەخرێتە داوەوە دەی هەمو ئیشەكانی خوا هەر وایە، چونكە كابرا نازانێ لە ئایندەدا چی لە گەڵدا دەكرێت تا ڕوودەدات لێی ئینجا بە خۆی دەزانێت، ئینجا ﷲ زیاتر پێناسەیان دەكات‌و دەفەرموێ:

(١٤٣) ئەمانە دوو دڵن نە بەرەو خاوەن باوەڕان بەراستی دەڕۆن‌و نە بەرەو كافران، بەڵێ بەراستی ئەمانە كۆمەڵێكی فەوتاوو

۞ لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٥١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ أُو۟لَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٥٢﴾ يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾

گومڕاو دۆڕاون، وه ئەو کەسەی کە ﷲ گومڕاهی بکات تۆ هەرگیز هیچ ڕێگایەکی تری بۆپەیدا ناکەیت. پێویستە ئەوەش بزانین کە ﷲ کەس گومڕا ناکات، مەگەر کابرا خۆی مەبەستی گومڕا کردنی خۆی بێت‌و هەمیشە ڕێگای چەوت‌و نالەبار هەڵبژێرێت، ئەمەش کە بڵێین هەر کەسێك کە خوا گومڕاهی بکات یان هیدایەتی بدات کەس ناتوانێ پێچەوانەی بکات ڕاستە بەڵام ئەمە دوو شتی جیاوازن **یەکەمیان**: مرۆڤ خۆی هۆیەتی. **دووهەمیان**: بە دەست خوایە، بەڵام خوا ئەمەیان ناکات، چونکە سوود لە تاقیکردنەوەدا نامینێت، چاك لەم بابەتە وردبەرەوە چونکە بیروباوەڕتە.

﴿١٤٤﴾ ئەی ئیمانداران هەرگیز کافران نەکەن بە دۆستی خۆتان بێجگە لە خاوەن باوەڕان ئایا دەتانەوێت بەم ئیشە بەڵگەیەکی ئاشکراو ڕوون بۆ تۆڵەو سزاتان بدەنە دەست خودا؟! کە ئەمە ئیشی دووڕووەکانە جابۆیە دەفەموێ:

﴿١٤٥﴾ بە بێگومان کە مونافقان وان لە خواروی ئاگری جهەنمداو بۆ ئەوان هەرگیز هیچ یارمەتی دەرێکت دەست ناکەوێت کە لە سزای ئێمە ڕزگاریان بکات. بەڵێ بەراستی دوو ڕووەکان زۆر پڕ مەترسین‌و کۆسپێکی دژوارن لە ڕێگای موسڵمانان دا جا بۆیە سزای گەورەیان بۆ دانراوە، بەڵام خوا زۆر میهرەبانە ئەو تاوانبارانە ئەگەر تەوبە بکەن خوا لێیان وەرئەگرێت وەك دەفەرموێ:

﴿١٤٦﴾ مەگەر کەسانێك کە تەوبە بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای خواو بڵێن خوایە ئێمە لەم ڕەفتارانەماندا بە هەڵە دا چوین‌و ئیشی باش بکەن‌و دەست بگرن بە ئایینەکەی خواوە، ئەوسا ئەوانە لە گەڵ ئیمانداران حیسابیان بۆ دەکرێت ودەمێکی تراﷲ پاداشتێکی گەورە دەدات بە خاوەن باوەڕان، وتراوە: (**أخلِص دِينَكَ يَكفِكَ القَلِيلُ مِنَ العَمَلِ** /واتە: باوەڕەکەت پاڵفتە بکەرەوەو خۆت یەك لا بکەرەوە بۆ ﷲ ئەو کاتە کەمێك لەکردارت بەستە)

﴿١٤٧﴾ ئەگەر ئێوە شوکری ﷲ بکەن‌و باوەڕ بهێنن خودا سزادانی ئێوەی بۆچییە؟ وە خوا پاداشتی سوپاسکاران بە چەند بەرامبەر دەداتەوە وزۆر زانایە بە ئیشەکانتان. شوکری بەندە ئەوەیە کە گوێرایەڵی پەروەردگار بکات (**الطاعة**) شوکری خواش ئەوەی کە بەو عیبادەتە کەمەی کە بەندە دەیکات ڕازی دەبێت‌و پاداشتی چەند بەرامبەری پێ بداتەوە (**الثواب**)

﴿١٤٨﴾ ﷲ ئاشکراکردنی قسەی ناشیرین‌و نابەجێ‌و جنێودانی پێ خۆش نیە مەگەر کەسێك ستەم لێکراو بێت ئا ئەم کەسە بۆی هەیە بە بانگەوری قسە بە کابرای ستەمکار بڵێت‌و ناوی ستەمەکەی لە ناو خەڵکدا ببات، بەڵام ئەگەر خۆی بگرێت‌و قسە نەکات ئەوە چاکترە بۆی مەگەر قسە نەکردنەکە ببێت بە هۆی شێرا بونی ئەو ستەمکارە بە سەر خەڵکی تردا لەم حاڵەتەدا باسکردن‌وئاشکرا کردنەکەی باشترە ئەوەش بەو مەرجە دروستە کە قسەو باسەکەی ئەو لە ستەمی کابرا زیاد نەکات. بەڵێ ئایینی مرۆڤ پەروەری ئیسلام دادپەروەرەو میزانی لە گەردیلەکان بچوکتریش دەخوێنێتەوەو مافی کەس بە سەر کەسەوە ناهێڵێت، لە کۆتاییدا دەفەرموێ: وە خوا بیسەری قسەو گفتوگۆکانتانەو زانەری ڕەفتارو کردارەکانتانەو هیچی لێ ون نابێت، کەواتە بزانن چی دەڵێن‌و چی دەکەن.

﴿١٤٩﴾ ئەگەر ئێوە چاکەیەك بە ئاشکرا بکەن یان بیشارنەوە یان چاوپۆشی لە کەسێك بکەن کە خراپەتان لە گەڵدا دەکات بەراستی ئەوە ئەبێتە هۆی نزیك بونەوەتان لە خواو پاداشتی گەورەی ئەو زاتە بەرزو بەرێزە چونکە ئەمە سیفەتێکە لە سیفەتاەکانی خوا کە چاوپۆشی دەکات لە تاوانی بەندەکانی لە گەڵ ئەوەشدا دەتوانێت کە تۆڵەیان لێ بسێنێت بۆیە بە دوای ئەو ڕێنماییە بە نرخەدا دەفەرموێ: ئەوسا بەبێگومان کە ﷲ چاوپۆشی کەرەو خاوەن دەسەڵات. لە فەرمودەدا هاتوە کە{**مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ وَمَا زَادَ اللهُ عَبْدًا بِعَفْوٍ إلا عِزا وَمَا تَوَاضَعَ أَحَدٌ لِلهِ إلا رَفَعَهُ الله** /مسلم وغ ه / هەرگیز ماڵ کەم نابێتەوە بە هۆی چاکە کردنەوە ، وە خوا هیچ بەندە زیاد ناکات بە بۆنەی چاوپۆشی کردنیەوە لە

فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ وَكُفۡرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتۡلِهِمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ وَقَوۡلِهِمۡ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢۚ بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفۡرِهِمۡ وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا ﴿١٥٦﴾ وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤۡمِنَنَّ بِهِۦ قَبۡلَ مَوۡتِهِۦۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا ﴿١٥٩﴾ فَبِظُلۡمٖ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتۡ لَهُمۡ وَبِصَدِّهِمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرٗا ﴿١٦٠﴾ وَأَخۡذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدۡ نُهُواْ عَنۡهُ وَأَكۡلِهِمۡ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿١٦١﴾ لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ مِنۡهُمۡ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ يُؤۡمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَۚ وَٱلۡمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَۚ وَٱلۡمُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أُوْلَٰٓئِكَ سَنُؤۡتِيهِمۡ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾

خەڵك مەگەر زیاتر بەرزی بکاتەوە ، وە هەر کەسێك خۆی نزم بکاتەوە لە بەر خوا، خوا ئەو کەسە بەرز دەکاتەوە} ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(١٥٠) بە بێگومان ئەوانەی کە بێباوەڕ دەبن بە ﷲو بە پێغەمبەرانیو دەیانەوێ جیاوازی دروست بکەن لە نێوان خواو پێغەمبەرانی داو دەڵێن: باوەڕمان هەیە بە هەندێك لە پێغەمبەرانو بێباوەڕین بە هەندێکی تریان، دەیانەوێ بەم شێوەیە لە نێوانە بێباوەڕبوون بە پێغەمبەران بەتەواویو باوەڕداربوون بە هەموویان ڕێگایەك بۆ خۆیان بدۆزنەوە بە بێ ئەوەی کەهیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت. جوەکان باوەڕیان بە عیساو بە محمدﷺ نیەو گاورانیش باوەڕ بە پێغەمبەرﷺ ناکەنو هەریەکە لەوانەش خۆی بە ڕاست دەزانێتو ئەوی تر بەهەڵە، بەڵام خوا دەفەرموێ:

(١٥١) کافر بونی ئەوانە شتێکی ڕاستو بێ پێچو پەنایە، وەئێمەش ئامادەمان کردوە بۆ ئەو کافرانە سزایەکی سەرشۆڕ کەرو گاڵتەکەر بە سزادراوان. لە پاش باسی کافرانو پاداشتەکەیان باسی باوەڕدارانو پاداشتەکەیان دەکاتو دەفەرموێ:

(١٥٢) خۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بە ﷲو بە پێغەمبەرەکانیو هیچ جیاوازیەك دروست ناکەن لە نێوان هیچکامیاندا ئەوانە بەم زوانە پەروەردگار پاداشتی کردارە چاکەکانیان دەداتەوەو ﷲ لێبوردەو بە سۆزە بۆ بەندە چاکەکانیو پاداشتی چەندان بەرامبەریان دەداتەوەو لە تاوانەکانیان خۆش دەبێت.

(١٥٣) خاوەنی کتێب کە جولەکەو گاورن داوات لێ دەکەنو دەڵێن کە تۆ پەڕاوێکمان بۆ بێنە لە ئاسمانەوە کە بە ئێمە فەرمان درابێت کە باوەڕ بە تۆ بکەین خوایش دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ: خۆ بەراستی ئەم جولەکانە لە موسایش داوای شتی گەورەتریان کردوە واتە ئەگەر ئێستە داوای کتێبی نوسراوی وەك تەورات لە تۆ دەکەن خۆ کاتێ تەوراتی نوسراویش بۆ موسا هات باوەڕیان پێ نەکردو داوای شتی گەورەتریان لێ کردو وتیان خودامان بەئاشکراپێشان بدە واتە سەرت لەم کۆمەڵە چەنە بازو ڕەخنە گرە سوڕ نەمێنێت ئەمانە هەر لە کۆنەوە ئەم داخوازیە گەورەو پڕ مەترسیانەیان کردوە جا بۆیە دەنگێکی زۆر توندو بە هێز ئەوانی گرتو لە ناوی دان بە هۆی ئەو ستەمە گەورەیەی کە کردیان. جا ﷲ درێژە بە ڕونکردنەوەی وتارو کردارە ناشیرینەکانی جولەکە ئەداتو دەفەرموێ: لە پاشان دەستیان دایە گوێرەکە پەرستی دوای ئەوەی کە چەندین بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ هاتبوو سەبارەت بەراستی موساو بانگەوازەکەی وەك دەستیو عەساکەیو شەقی بەحرو خنکانی فیرعەونو دەیان بەڵگەی ڕۆشنی تر هەر کە موسا چوو بۆ کێوی توورو قسە کردن لە گەڵ ﷲ دا تا موسا گەڕایەوە سامیری لەو خشڵەی کە بە دەستیان هێنابوو گوێرەکەیەکی بۆ دروستکردنو بانگی کردن بۆ پەرستنیو ئەوانیش نە چاوەڕوانی موسایان کردو نە بە گوێی هارونو پیاو چاکانی خویانیان کرد گورج دەستیان کرد بە پەرستنی ئەو گوێرەکە دروستکراوەو تا موسا نەگەڕایەوە وازیان نەهێنا کە ئەم باسە بە درێژی لە سورەتی "ئەعراف"و "تاها" دا هاتوە. لە گەل ئەو تاوانە گەورەیەشدا ﷲدەفەرموێ: ئەوسا پاش ئەوەیش ئێمە چاوپۆشیمان لێ کردنو ئێمە بەڵگەی بە هێزو ڕۆشنمان دا بە موسا، کە بەشێك لەو بەڵگە بە هێزو ڕۆشنانە ئەوەبو کە خوا دەفەرموێ:

(١٥٤) جا بەهۆی پەیمانێك کەدایانبو کێوی تورمان بەرزکردەوە بە سەر ئەواندا و وتمان: لەو دەرگای بەیتو لموقەدەسەوە بچنە ژورەوە بە سوجدە بردن بەڵام ئەوان لەوەشدا بە پێچەوانەوە جوڵانەوەو پشتاو پشت چوونە ناو قودسەوەو لە باتی دوعای خێر داوای گەنمو جۆیان دەکرد، وە پێمان وتن: لە ڕۆژی شەممەدا دەست درێژی نەکەنو پەیمانێکی گەورەمان لێوەرگرتن. کەچی هەر هەموویان شکاندن بۆیە دەفەرموێ:

(١٥٥) جا بە هۆی پەیمان شکاندنیانو کافر بونیان بە نیشانەکانی ﷲو کوشتنی پێغەمبەران بە بێ تاوانو بەهۆی ئەوقسەوە کە دەیان وت: دڵمان داخراوەو هیچ قسەیەك نابیسینو پێویست ناکات قسەمان بۆ بکەن، لە ڕاستی دا ئەوان کەڕ نەبون بەڵکو خوا

دڵەكانیانی مۆر كردبو بە هۆی ئەو هەمو كوفرو تاوانانەوە كە دەیان كرد كەواتە ئەوان باوەڕ ناهێنن مەگەر كەمێكیان، یان باوەڕ ناهێنن مەگەر بە چەند شتێكی كەم لەم ئایینەو ئەوەی كە بۆ خۆیان بە سوودی بزانن، ئاشكرایە كە ئەمەش شتێكی ناڕەوایەو لێیان وەرناگیرێت. ئینجا خوا زیاتر پێ ناسەیان دەكاتو دەفەرموێ:

(١٥٦) هەر بە هۆی كوفریانو ئەو قسە ناشیرینەی كەئەوان دەیانكرد دەربارەی مەریەم كە بۆختانێكی گەورەیان بۆ هەڵبەستبو كەدەیان وت: زینای كردوە، پەنا بە خوا.

(١٥٧) هەروەها دڵەكانیان مۆر كرا بە هۆی ئەو قسە ناشیرینانەی كە دەیان وت: بە بێگومان ئێمە عیسای كوڕی مەریەم كە پێغەمبەری خوا بو كوشتووە، لەكاتێكدا نە كوشتیانو نە هەڵیان واسیوە بەڵام لێیان گۆڕا، وە بێگومان ئەو كەسانەی كە ناڕێكیان هەبو سەبارەت بە كوشتنی عیسا ﷵ خۆیان كەوتنە گومانەوە لەم بارەیەوە بەراستی ئەوان هیچ زانیاریەكی راستیان لانەبو تەنها پەیڕەویان لە گومانەوە دەكرد، تەنانەت بكوژەكانیش هەر بە گومان وتیان عیسایە ئەگینا هیچ بەڵگەو زانیاریەكی راستیان لە لا نەبو خۆیشیان بە گومان بون كە ئەمەی كوشتویانە ئایا عیسایە یان نە. وتراوە كاتێ كە چوونە سەر عیساو گەمارۆیان دا عیسا ﷵوتی: كێ دەیەوێ ئێستا شێوەی منی بە سەرا بكشێت ئەوە دەبێ بە رەفیقم لە بەهەشتدا؟ لاوێك هەستایە سەر پێو وتی: من دەمەوێ، بەڵام چونكە تەمەنی منالْ بو جارێكی تر دووبارەی كردەوە دیسان هەمان لاو وتی: من. جاری سێهەم قسەكەی دووبارە كردەوە دیسان هەرئەو لاوە هەستاو وتی: من. ئینجا ﷲ شێوەی لاوەكەی وەك عیسا لێ كردو عیسای لە كلاو رۆشنەی ئەو هودەوە هەڵكێشا پاش ئەوەی كە خەوێك هات بە سەر عیسا داو بردی بۆ ئاسمان جا كاتێ كە ئەو بەرز كرایەوە ئەو چەند كەسەی كە لە گەڵ عیسا دا بوون هاتنە دەرەوەو هێرش كەرانیش ئەو لاوەی كە وێنەی عیسای بە سەردا كێشرابو بە عیسایان زانیو گرتیانو كوشتیانو هەڵیان واسیو بەم شێوەیە ﷲعیسای بەرز كردەوەو ئەو تاوانبارانەیش ئەو لاوەیان شەهید كردو وتیان: عیسامان كوشتوەو گاورەكانیش باوەڕیان كرد بێجگە لەو چەند كەسە راستە نەبێ كە خۆیان بە چاوی خۆیان رزگار بوونو بەرز بونەوەی عیسایان دیتو زانیان كە ئەو كوژراوەیش رەفیقی خۆیان بوەو عیسا نەبوە، جا قورئان هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرمانﷺو هەموویانی بە درۆ خستەوەو فەرموی: جا بە دڵنیاییەوە ئەوان عیسایان نەكوشتوەو جوەكانیش خۆیان لە بارەی كوشتنی عیساوە دڵنیا نەبوون، ئینجا خوا زیاتر بە درۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ:

(١٥٨) بەڵكو خوا بەرزی كردەوە بۆ لای خۆی، وە خوا خاوەنی دەسەڵاتەو ئیشەكانیشی بە حیكمەتە. چەندین فەرمودە لەم بارەیەوە هەیە واتە لە بارەی عیساﷵ كە راسترین قسە ئەمەیە كە ﷲ عیسای بەرز كردوەتەوە بۆ ئاسمان و لە ژیاندایە، لە كاتێك دا كە دەجال دێ‌و ئەوەی كە خراپە پەیڕەوی دەكاتو لەشكری موسڵمانان خەریكی نوێژی بەیانی دەبنو قامەت دەكەن لەو كاتەدا عیسا دێتە خوارەوە جا ئیمام لە شوێنی خۆی دێتە پاشەوەو داوا لە عیسا ﷵدەكات كە بێتە پێشەوە، عیسا ﷵ دەفەرموێ: نەخێر قامەت بۆ تۆ كراوەو ئەم ئومەتە دەبێ ئیمامی لە خۆی بێت جا عیسا ئیقتیدا بەو ئیمامە دەكات، ئینجا دوای دەجال دەكەوێتو لە جێگایەكی فەلەستین بە ناو (**باب لد**) دەیگاتیو دەیكوژێتو پاش ماوەیەك عیسا وەفات دەكات، ئینجا پێش وەفاتی عیسا باجو خەراج لادەباتو دەستور دەدات جا هەرچی بەرازە دەكوژرێتو هەرچی سەلیبە دەشكێندرێت، ئینجا هیچ كەسێك نامێنێت تەنها ئەو كەسە نەبێت كە باوەڕیان بە پێغەمبەرﷺ هەبێت وە بۆ ماوەی چل ساڵ ئەودەسەڵاتە دەژیتو هیچ حەیوانێكی ژەهراوی ژەهری نامینێ‌و منالْ یاری بە مار دەكاتو گورگو مەڕ بە یەكەوە دەلەوەڕێن واتە سەر ئەنجام ئەم دینە سەر دەكەوێت بە سەر تەواوی دینەكانی تردا ماوەیەكیش پاش عیسا ﷵبەو شێوەیە دەبێت، ئینجا بایەك هەڵدەكاتو هەركێ بڵێت (**لا الە الا ا** ) بەو بایە دەمرێت وەكو نەخۆشی ئاڵەمەت (**الزكام**) جا تەنها فاجرو فاسد وخراپەكان كە لە ترسا تا ئەم كاتە خۆیان لە ناو ریزی موسڵمانان دا شاردبویەوە دەمینێتو دەست دەدەنە خراپەكاریو تاوان بە شێوەیەك كە وەك گوێ درێژ سواری یەكتر دەبن جا بە سەر ئەم گەلە پیسەدا دنیا وێران دەبێت؟!

(١٥٩) خۆهیچ كەسێكیش نیە لە ئەهلی كتێب مەگەر باوەڕ دێنێت بە عیسا ﷵلە پێش ئەوەی كە عیسا بمرێت واتە كاتێك كە عیسا دادەبەزێت گاورو جوەكانی ئەو كاتە هەموویان ئیمانی پێ‌دێنن، ئەمەش بەم مانایە بەڵگەیەكی بەهێزە لە سەر ژیانومانی عیسا تا دێتە خوارەوە. هەندێك دەڵێن: ئەو (ه) لە وشەی ﴿مَوۡتِهِۦ﴾ بۆ ئەهلی كتێبە دەچێتەوە واتە هەمو ئەهلی كتێب بەر لەوەی كە بمرن باوەڕ دەهێنن بە عیسا : ﷵ ئەمەش لە سەرە مەرگیاندا دەبێ چونكە بۆیان دەردەكەوێت كە عیسا راست بوەو ئەوان هەردوو لە سەر هەڵە بوون بەڵام ئەم باوەڕ هێنانە سودی نابێ بۆیان، ئینجا دەفەرموێ: وە لە رۆژی قیامەتدا عیسا لە سەر ئەوان شایەت دەبێت، كە ئەوان راستیان نەكردوە، وەكو لە سورەتی مائیدە دا دەفەرموێ: ﷲ بانگ دەكاتە عیساو پرسیاری لێ دەكات، كە ئایا تۆ وتوتە جگە لە ﷲ، من ودایكیشم دوو خودایەن؟ لە وەڵامدا دەڵێ: یا رەبی تۆ ئاگاداری من چیم پێ

وتون، من قەت قسەی ناڕەوام پێ نەوتوون ، وە ئەگەر من قسەیەکی وام کردبێت تۆ دەزانیت، وە ئەم قسەو گفتوگۆیە لەو سورەدا دێت **ان شاء ا** . ئینجا اللهُ هەر درێژە بەباسی ئەو تاوانانەی خاوەن کتێبان دەداتو تاوانێکی ترمان بەم شێوەیە بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٦٠) هەر بە هۆی ستەمێکەوەو کە جووەکان کردیانو زۆر ڕێگا گرتنیان لە بڵاوبوونەوەی ئایینی اللهُ، ئێمە چەندین شتی پاکمان لێ حەرام کردن کە ئەو حەرامانە لە پێشدا حەڵاڵ بو بۆیان وەك گۆشتو شیری حوشترو چەند شتێکی تر وەك لە سورەتی (**انعام** : ١٤٦) دا هاتوە.

(١٦١) ئەوسا بە هۆی ریبا وەرگرتنیانەوە لە کاتێکدا بێشك ئەوان کاتی خۆی لەو ڕەوشتە ناپەسەندە بەرگری کرابوون، وە بە هۆی ئەوەی کە ماڵی خەڵکیان بە ناڕەوا دەخوارد، بۆیە ئێمەش بۆ ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون لەوان سزایەکی دەردناکمان بۆ ئامادە کردن. چونکە ئەوان خۆیان بە (**شعب ا** ) موختار دەزانیو پێیان وابو کە ئەو زەویو ئاسمانە بۆ ئەوان دروستکراوەو لە دەستی هەر کەسێکدا بێت مافی خۆیانە کە لێی بسێننەوەو بیخۆنو بە حەڵاڵیان دەزانی، جا شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئەم خاوەن کتێبانە وەك یەك نینو خوای داناو دادپەروەر تاوانی کەس لە سەر کەس دانانێت، ئەوەتە لێرەش جیایان دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(١٦٢) بەڵام ئەوانەی لەوان کە زۆر چوونەتە خوارەوە لە عیلمو زانینداو باوەڕدارن، باوەڕیان هەیە بەوەی کە ڕەوانە کراوە بۆ تۆ ئەی محمدﷺ بەوەی کە ڕەوانە کراوە لە پێش تۆدا وەك تەوراتو ئینجیلو زەبورو سەحیفەکانو بە تایبەت ئەوانەی کە نوێژ دەکەنو ئەوانەی کە زەکات دەدەن چ زەکاتی ماڵ بێت چ زەکاتی گیان، وە ئەوانە کە باوەڕیان بە اللهُو بە ڕۆژی دوایی هەیە ئائەوانە بەم زوانە پاداشتێکی گەورەیان پێ دەدەین. وشەی ﴿وَالْمُقِيمِينَ الصَّلَوٰةَ﴾ جیا کراوەتەوە لەوانی تر لە سەرو ژێردا بۆ زیاتر بایەخدانە بە نوێژ، چونکە نوێژ کۆڵەکەی ئاینەو دەرمانێکی بە سودو ئارام بەخشە بۆ خاوەن باوەڕان بە تایبەت لە کاتی تەنگانەو گیرو گرفتدا، ئەوان بە بۆر (مرفوع) دەخوێنرێنەوە بەڵام ئەم بە سەر (منصوب) دەخوێنرێتەوە کە مەفعولە بۆ فعلێکی وەك **(امدحُ یان اخُصُ).**

(١٦٣) بە بێگومان ئەی محمد ﷺ ئێمە وەحیمان کردە لای تۆ هەروەك چۆن وەحیمان کردوتەوە لای نوحو ئەو پێغەمبەرانەی کە لە پاش نوح بوون، واتە ئەمەی تۆ شتێکی تازە نیە، وە هەوەرها بۆ ئەمانە هەمویان کە ئیبراهیمو ئیماعیلو اسحاقو یعقوبو ئەسباتو عیساو ئەیوبو یونسو هارونو سلیمانە وەحیمان کردوەو زەبوریشمان داوە بە داوود (سەلامی خوا

۞ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ﴿١٦٤﴾ رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا ﴿١٦٥﴾ لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿١٦٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ﴿١٦٨﴾ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلۡحَقِّ مِن رَّبِّكُمۡ فَـَٔامِنُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ وَإِن تَكۡفُرُواْ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١٧٠﴾

لەهەمویان).وەحی بریتیە لە ناردنی پەیامی خوا بۆ پێغەمبەران کە شێوەی جیا جیای بوە.

(١٦٤) خۆچەندین پێغەمبەر بوون لە پێش تۆدا ئەی محمدﷺ کە داستانی ئەوانمان بۆ باسکردویتو چەندین پێغەمبەری تر بوون کە باسی ئەوانمان نەکردوە بۆت، واتە مەرج نیە کە ئێمە باسی هەمو پێغەمبەرێك بۆ تۆ بکەین، وە اللهُراستەوخۆ گفتوگۆی کرد لە تەك موسادا لە کێوی "تور" ئەوە بوو فەرموی: ئەی موسا بەراستی من پەروەردگاری تۆم. هەروەها دوای ئەوە کە موسا لە ناو قەومەکەی چوو بۆ گفتو گۆ لە تەك خوادا گفتو گۆی لە گەڵ کرد، بەشێك لەو گفتوگۆیەش ئەوەبو فەرموی: چ شتێك وا پەلەی بە تۆ کرد کە پێش گەلەکەت بکەویت ئەی موسا؟ ئەمەو ئایەتی پێشوو کەدرێژەی گفتوگۆکانە لە سورەتی (**طه**) دا دەیبیسی **ان شاء ا** .

(١٦٥) ئێمە ئەم پێغەمبەرانەمان ناردوون تا ئەوان موژدە بدەن بەو کەسانە کە ئیشی باش دەکەن بە بەهەشت وە بترسێنن بە ئاگری جەهەنم ئەو کەسانەی کە خراپە دەکەن بۆیە پێغەمبەرانیشمان بەم شێوەیە ناردوە تا ئیتر بۆ هیچ کەسێك بەهانە نەمێنێت لە لای اللهُ کە بڵێن: خوایە ئێمە نەمانزانیوە، ئەوسا اللهُ دەسەڵاتدارو دانایەو هەمو فەرمانو بڕیارو ئیشەکانی بەدانایی داناوە. ئینجا بۆمان دەرکەوت کە ئەم پێغەمبەرانە هەمویان بۆ یەك مەبەستی گرنگ هاتوون ئەوویش ڕێی پێشاندانو ڕێنمایی خەڵکە بۆ یەکتاپەرستیو نەهێشتنی بەهانەو

يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾ لَّن يَسۡتَنكِفَ ٱلۡمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبۡدٗا لِّلَّهِ وَلَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ٱلۡمُقَرَّبُونَۚ وَمَن يَسۡتَنكِفۡ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيَسۡتَكۡبِرۡ فَسَيَحۡشُرُهُمۡ إِلَيۡهِ جَمِيعٗا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمۡ أُجُورَهُمۡ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۖ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡتَنكَفُواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿١٧٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَكُم بُرۡهَٰنٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ نُورٗا مُّبِينٗا ﴿١٧٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَٱعۡتَصَمُواْ بِهِۦ فَسَيُدۡخِلُهُمۡ فِي رَحۡمَةٖ مِّنۡهُ وَفَضۡلٖ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَيۡهِ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿١٧٥﴾

رون کردنەوەی حەق‌و ناحەقە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**الْأَنْبِيَاءُ إِخْوَةٌ مِنْ عَلَاتٍ وَأُمَّهَاتُهُمْ شَتَّى وَدِينُهُمْ وَاحِدٌ**/مسلم/ هەموو پێغەمبەران برایانی یەك بەرە بابن، بەڵام دایکانیان جیایە و ڕێبازەکەیان یەکە} واتە، ئایین هەموی ئایینی خودایەو بەرنامەو عەقیدەی هەمویان یەکە بەڵام لە فروعات فەرقیان هەیە جا بۆ داکۆکی کردن لە سەر ڕاستی قورئان دەفەرموێ:

﴿١٦٦﴾ بەڵام اللّٰه خۆی شایەتی دەدات سەبارەت بەو شتەی کە ڕەوانەی کردووتە لای تۆ کە حەق‌و ڕاستە، لە سەر بناغەی زانیاری و ئاگاداری خۆی ئەم قورئانەی ناردوە بۆ تۆو هەروا بەگۆترە نیە واتە ئەو زاتە گەورەیە هەروا ئەم قورئانەی نەناردوە کە نەتوانێ گیرو گرفتەکان چارەسەر بکات بۆ ئەم گەلە هەتا قیامەت جا ئەمە بەرپرچ دانەوەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن: ئایینی ئیسلام بە دەردی ئەمڕۆ ناخوات (پەنا بە خوا) واتە خوا ئاگای لە ئەمڕۆ نەبوە، جا با ئەمانە شایەتی بۆ ڕاستی قورئان نەدەن خوا خۆی و فریشتەکانیش شایەتی دەدەن لە سەر ڕاستی‌و دروستی ئەم قورئانە. ئە گەرکەسێك کە خاوەنی شعوربێت بەسە کەخوا خۆی شایەت بێت. بەڵێ بەڕاستی زانیاریەکی وا لەناو قورئاندایەلە هیچ پەڕاوییێکی تردا نەبوەو نابێت جا زۆرێك لە دانیشمەندانی ڕاستەقینە هەر بە وردبوونەوە لەم قورئانە پایەبەرزە باوەڕیان هێناوەو دەیهێنن، جا با نەفامان هەر لەمانگ بوەڕن، وتراوە"دەریا بەدەمی سەگ گلاو نابێت" ئینجا خوا بڕیاری خۆی سەبارەت بە بێباوەڕان بەم قورئانە ڕادەگەیەنێت‌و دەفەرموێ:

﴿١٦٧﴾ بە بێگومان ئەوکەسانەی کە کافرن‌و دەبن بە پەرچ لە ڕێگای خواداو ناهێڵن خەڵك لە سەر ڕێگای خوادا بڕوات بەڕاستی ئەوانە گومڕاهن بە گومڕاهیەکی دوور لە ڕاستی. دووبارە دەفەرموێ:

﴿١٦٨﴾ بە دڵنیاییەوە ئەوکەسانەی کە کافرن‌و ستەمیان کردوە ئائەمانە ئیتر اللّٰه لێیان خۆش نابێت‌و بۆ هیچ ڕێگایەك ڕێنماییان ناکات.

﴿١٦٩﴾ مەگەر بۆ ڕێگای جەهەنم کە بۆ هەمیشەیی لەو جێگە نالە بارەدا دەمێننەوە، و ە ئەمە لەلای اللّٰه شتێکی زۆر ئاسانە، بە فەرمانێکی ئەو زاتە هەمو شت جێ بە جێ دەکرێت.

﴿١٧٠﴾ ئەی خەڵکینە بەڕاستی ئەم پێغەمبەرە لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتوەتە لاتان کە بەڵگەی ڕاستی‌و دروستی خۆی پێیە کە ئەم قورئانەیە دەی باوەڕ بهێنن ئەوە چاکە بۆتان ، وە ئەگەر کافریش بن اللّٰه هیچ زیانێك ناکات‌و شتێك لە موڵکی ئەو کەم نابێتەوە چونکە بەبێگومان ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەوی دایە هەموی موڵکی خوایە و خوا عیلمی هەیەو بڕیارەکانی لە سەر زانین‌و ئیشەکانیشی دانایانەیە. دەی تا کەی ئەی مرۆڤ بیر لە خۆت ناکەیتەوەو سەری بەندایەتی بۆ پەروەردگاری زاناو دانای خۆت نەوی ناکەیت؟ خۆکاتەکانی تەمەنت بە پەلەو بێ پسانەوە بەرەو تەواو بون دەڕوات هەتا دەرفەت هەیە فریای خۆت بکەوەو پەشیمانی ئێستەت چاکەو سبەینێ دەستی خۆت دەگەزیت‌و (يَالَيْتَنِي .. يَالَيْتَنِي) دەڵێیت‌و هیچ سودیشت پێ نادات.

﴿١٧١﴾ ئەی ئەهلی کتێب زیادە ڕەوی مەکەن لە دینەکەتانداو جگە لە شتی ڕاست‌و دروست لە بارەی خوداوە شتێکی تر نەڵێن عیسای کوڕی مەریەم تەنها هەر پێغەمبەری خوایەو کەلیمەی خۆیەتی کە ناردویەتێ لای مەریەم‌و گیانێکە لە لایەنی خۆیەوە سا ئێوەش باوەڕ بهێنن بە خواو بە پێغەمبەرکانی‌و هیچ جیاوازیەك دروست نەکەن لە نێوانیانداو هەرگیز نەڵێن سێ خودان، واتە مەریەم‌و عیساش لەگەڵ اللّٰه دا بە خوا مەزانن واز بهێنن لەو بیروبۆچونە خراپە هەر ئەوە چاکە بۆتان، تەنها اللّٰه تاکە پەرەستراوی ڕاستەقینەیە، پاك‌و بێ عەیبەو بێنیازیشە لەوەی کە ئەو مندالی هەبێت، ئەوەش کە لە ئاسمانان‌و زەوی دایە کە عیساش یەکێکە لەوانە موڵکی خوایە دەی موڵك چۆن دەبێت بە منالی خاوەنی، چونکە منالی هەمیشە هاوبەشە لە گەڵ باوکیداو خاوەنی هێزەو بۆی هەیە دەست بخاتە ناو کارو باری باوکیەوە، بەڵام موڵك نە هاوبەشی خاوەنیەتی‌و نەتوانای بەرامبەری کردنی خاوەنی هەیە، جا بەسە کە اللّٰه پشتیوان بێت بۆ مرۆڤ. بەڕاستی مرۆڤ جگە لە اللّٰه پێویستی بە کەسی تر نیە

ئەگەر خۆی‌و خالقی خۆی بە چاکی بناسێت. پاشان جارێکی تر بەرپەرچی ئەوانە دەداتەوە کە دەڵێن عیسا خوایە و دەفەرموێ:

(١٧٢) هەرگیز مەسیح خۆی بە گەورە ناگرێت و پێی عەیب نیە کە ئەو بەندەیەکی خوا بێت‌و فریشتە گەورەو نزیکەکانیش هیچ کامیان خۆیان بە گەورە ناگرن سەبارەت بە بەندایەتی کردنی خودا، وە ئەو کەسەی کە خۆی بگرێتەوە لە بەندایەتی خواو لوت بەرز بێت‌و خۆی بە گەورە بزانێت بەم زوانە خوا هەمویان کۆ دەکاتەوە لە لای خۆی و بە هەر کەسێکیش بەگوێرەی کرداری خۆی سزا یان پاداش دەدات. جا ستەم لە کەس ناکات‌و کەسیشی لێ ناشارێتەوە وەك دەفەرموێ:

(١٧٣) ئەوسا ئەوکەسانەی کەوا باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە بەم زوانە خوا پاداشتیان دەداتەوە بە ڕێك وپێکی‌و لە نیعمەتی خۆی زیادیش دەکات بۆیان واتە چەند ئیشیان کردوە بێ کەم کردنەوەی پاداشیان پێ دەدرێتەوە، سەرەڕای ئەوەش بە لوتف‌و بەخشندەیی خۆی چەندین بەرامبەر زیادەیشیان پێ دەدات. وە ئەو کەسانەی کە خۆیان گرتوەتەوە لە بەندایەتی خواو خۆیان بە گەورە زانیوە کە گەردنکەچی فەرمانی خوابن ئەوسا خوا سزایان دەدات بە سزایەکی زۆر دەردناك‌و هەرگیز بۆ ئەوانە بێجگە لە الله هیچ دۆستێك‌و هیچ یارمەتی دەرێك نیە کە لە سزای پەروەردگار بیانپارێزێت. پاش ئەوەی کە دەمکوتی گاورەکانی کرد سەبارەت بە عیسا (عليه السلام)‌و خوایەتی‌و کوڕیەتی عیسای هەڵوەشاندەوە کە بیروڕای گاورەکانە بۆ جارێکی تر هەمو خەڵك بەرەو دواترین پەیام وبەرەو دواترین پێغەمبەر (ﷺ) بانگ دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٧٤) ئەی خەڵکینە لەهەر کوێدا هەی بە بێ جیاوازی نژادو ڕەنگ‌و زمان بەراستی بەڵگەی ڕون‌و ئاشکرا لە لایەن پەروەردگارتانەوە هاتوەتە لاتان کە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)‌و روناکییەك کە روناك کەرەوەی ڕاست‌و ناراستیە ڕەوانەمان کردوەتەلاتان. بەراستی ئەگەر مرۆڤ دەست بگرێت بەم دووانەوە کە قورئان‌و سونەتە هەرگیز گومڕاوو سەرلێ شێواو نابێت.

(١٧٥) جا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو دەستیان گرتوە بە ئایینەکەی خوا ، ئەوسا بەم زوانە دەیانخاتە ناو ڕەحمەت‌وسۆزی خۆی‌و زیاتریش‌و لە دنیادا ڕێنماییان دەکات بۆ ڕێگای ڕاست کە بەرەو خۆی دەیان بات. واتە دەبێ مرۆڤ خۆی هەوڵ بدات‌و تەلاش بکات بۆ پەیڕەوی کردنی فەرمانەکانی خواو دەست بگرێت بە ئایینەکەیەوە، ئینجا خوا ڕۆشنی دەکاتەوەو زیاتر ئاشنا تری دەکات بە ئیسلام‌و ئایین نەك پاڵی لێ بداتەوەو بڵێت خوا بە ڕەحمە، ئینجا کۆتایی سورەتەکە دەلکێنی بەسەرەتاکەیەوە کە

يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِ ۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ (١٧٦)

## ٥ سُورَةُ المَائِدَة ١٢٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَوْفُوا۟ بِٱلْعُقُودِ ۚ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ غَيْرَ مُحِلِّى ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ (١) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ۚ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُوا۟ ۚ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا۟ ۘ وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ (٢)

سەبارەت بە دروست بونی مرۆڤ‌و بڵاو بونەوەی‌و دابەش کردنی میرات بو، دەفەرموێ:

(١٧٦) داوای فتوات لێدەکەن لە بارەی کەلالەوە پێیان بڵێ: خوا فتواتان بۆ دەدات لەو بارەوە، ئەگەر مرۆڤێك مرد کە نەدایك‌و باوك‌ونەمناڵی خۆی ونە کوڕەزای هەبو بەڵام خوشکێکی هەبو جا ئەو خوشکە نیوەی ئەوەی کە بە جێ ماوە لە براکەی دەبات، وە بەپێچەوانەوە ئەوبرایەش میرات دەبات لەوخوشکەی ئەگەر ئەوخوشکەی مرد نەدایك‌و باوك‌ونەمناڵی خۆی ونە کوڕەزای هەبو، جا ئەگەر ئەو خوشکانە دووان بون ئەوانە دوو بەش لە سێ یەکی ئەوەی کە بە جێ ماوە دەبەن وە ئەگەر هات‌و خوشك‌و برا تێکەڵاو بون ئەوە بۆ هەر نێرێك دوو بەرامبەری مێیەك لەومیراتە هەیە، الله ئاوا بە جوانی بۆتان ڕۆشن دەکاتەوە تا ئێوە گومڕا نەبن، وە الله زانیاری بە سەر هەمو شتێکدا هەیە. بەم ئایەتە دەوترێت ئایەتی هاوین چونکە لە هاوین دا دابەزیوە، هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە جابیر دەڵێت: پێغەمبەری خوا هاتە لام کە من نخۆشبوم‌و هۆشم بە خۆم نەبو پێغەمبەر(ﷺ) دەست نوێژی گرت‌و ئاوەکەی ڕژاند بە سەرما یان فەرموی: بیڕژێنن بە سەریاو هۆشم کردەوەو وتم: من بە کەلالە نەبێ میراتم لێ نابرێت ئیتر میراتم چۆن دابەش دەکرێت؟ ـ لە پێشەوە باسی کەلالەمان کرد ئەو کەسەیە کە دایك‌و باوك‌و ئەولادی نەبێت ـ جابیر دەڵێت: جا ئایەتی دابەش کردنی کەلەپور دابەزی. تەواوبو( ولله الحمد)

## ٥ سورەتی مائیدە ١٢٠

سورەتی مائیدە کە سورەتی پێنجەمی قورئانە، سەدوبیست ئایەتە، لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە، گومانی تێدا نیە کە هەندێ لە ئایەتەکانی لە رۆژی عەرفە لە ساڵی حەجیماڵئاوای پێغەمبەردا ﷺ دابەزیوە. ئەسمای کچی یەزید دەڵێ: { إني لآخِذَةٌ بِزِمَامِ الْعَضْبَاءِ نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ إِذْ أُنزِلَتْ عَلَيْهِ الْمَائِدَةُ كُلهَا فَكَادَتْ مِنْ ثِقَلِهَا تَدُق بِعَضُدِ النَاقَةِ/ ا د.وصححه البا /
بەڕاستی من رەشۆی (**عضباء**)ی وشتری پێغەمبەری خوام گرتبو کە لەو کاتەدا سورەتی (**مائدة**)ی بە تەواوی بۆ پێغەمبەر ﷺ نێررا کە خەریك بوو قوڵی وشترەکە بشکێت لە قورسی ئەو سورەتە}

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە وەفا بکەن بەو عەهدو پەیمانانەی کە لە بەینی خۆتاندا دەیبەستن‌و مەیشکێنن، حەڵاڵ کراوە بۆتان خواردنی گۆشتی مەڕو بزن‌و مانگاو حوشتر بەنێرو مێیانەوە بێجگەی لەوەی کە لە مەولا دەخوێنرێتەوە بەسەرتاندا، وە لەحاڵێکدا کە لەئیحرامدان راوی نێچیر نەکەن بە بێگومان ﷲ حوکم دەکات بەو شتەی کە خۆی ئیرادەی لێیەو کەس ناتوانێت رێگای لێ بگرێت چونکە ﷲ دەسەڵاتداری باشکۆیەو هەر خۆی خاوەنی ئیختیاری تەواوەو پرسیار ناکرێت لە خوا کەچی دەکەیت، بەڵکو دروستکراوەکانن پرسیاریان لێ دەکرێت وشەی ﴿ءَامَنُوٓاْ﴾ هەر کاتێ بە رەهایی فەرموی، واتە ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بەو شتانەی کە پێویستە لە سەریان وەکو باوەڕ بوون بە خواو بە رۆژی دوایی‌و بە فریشتەکان‌و بە کتێبەکانی خواو بە پێغەمبەران‌و بە قەزاو قەدەر. لەفەرمودەدا هاتوە: کابرایەك کە ئیحرامی بەست، نە بۆی هەیە خۆی راو بکات‌و نە کەسێکیش بۆی هەیە بە ناوی ئەوەوە ڕاو بکات جانەگەر بە ناوی ئەویشەوە راو کرا نابێ گۆشتەکەی بخوات. کابرایەك هاتە لای عەبدوڵا ی کوڕی مەسعودو وتی: ئامۆژگاریەکم بکە ، وتی: هەر کاتێ بیستت کە خوا فەرموی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ چاك گوێی بۆ بگرە، چونکە یان فەرمانت پێ دەکات بە کردنی ئیشێکی چاك یان بەرگریت دەکات لە ئیشێکی خراپ. زوهری دەڵێ: هەر کاتێ خوا فەرموی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئەی باوەڕداران ئەو شتە ئەنجام بدەن، ئەوە پێغەمبەریش خۆی یەکێکە لەو خاوەن باوەڕانەو رووی قسەش لەوە. پێویستە بزانین کە ئیمان وەختێك تەواوو سود بەخشە کە بە تەواوی خۆت بدەیتە دەست خواو بە عیشق‌و عەلاقەوە ئامادەی ئەنجام دانی فەرمانەکانی ببیت نەك بە زۆرە ملێ‌و لە کۆڵ کردنەوە بێت.

(٢) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەو دروشمە دیاری کراوانەی ﷲ کە قەدەغە کراون نابێ بە رەوایان دابنێن‌و نابێ مانگە قەدەغە کراوەکان کە(**ذوالقعدة و ذوا جة و رم**) کەئەم سێ مانگە بەیەکەوەن‌و (**رجب**) کەدەکەوێتەنێوان (**جمادا وشەعبان**) شەڕیان تێدا بکرێت‌و حورمەتیان بشکێت بەڵێ، دەبێ سنورەکانی شەرع بپارێزرێت‌و نابێ رێزی هیچ شتێکی ئایینی بشکێنرێت بەتایبەت دروشمەکانی حەج، وە ئەو حەیوانەی کە پێی ئەوترێت (**هدی**)و حاجیان دەیبەن بۆ حەج لە گەڵ خۆیاندا نابێ دەست درێژیان بکەنە سەرو پێویستیشە گەردن بەنیان بکرێتە مل‌و دیاری بکرێن تا کەس تەماعیان تێ نەکات‌و دەست درێژیان نەکرێتە سەر تا ئەگەنە شوێنی خۆیان‌و سەر دەبرێن ، وەئەوانەی کە لە (**بيت الحرام**)دان نابێ ریزیان بشکێنرێت‌و دەست درێژیان بکرێتەسەر، کەبۆ بەدەست هێنانی رزق‌ورۆزی‌و رەزامەندی پەروەردگاریان لەوێدان، جا هەر کاتێك لە حەج بونەوەو ئیحرامی حەجتان لابرد، ئەوسا ئیتر راو بکەن، واتە: ئەو کاتە دەتوانن راو بکەن. بۆ زانین: زۆربەی زانایان شەڕ کردنی مانگی حەرام بە هەڵوەشاوە دەزانن بە ئایەتی ﴿وَقَـٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَـٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗ﴾ التوبة: ٣٦.
ﷲ بەو پێغەمبەرەی ﷺ کە دەرکراوە لە مەکەو ئێستا لە مەدینەدایەو هەردەم ئێشو ئازاری پێ دەگات لە لایەن ئەوانەوە دەفەرموێ: نابێ ئەم ئێش‌و ئازارە وات لێ بکات کە تۆ بە دادپەروەرانە رەفتار نەکەیت لە گەڵیاندا، بەڵکو تۆ دەبێ دادپەروەر بی لە گەڵیانداو هەمیشە یارمەتی یەکتر بدەن لە سەر چاکەو لە سەر خۆپاراستن لەو شتانەی کە دەبێ بە هۆی تۆڵەو سزای خواو هەرگیز یارمەتی یەکتر نەدەن لە سەر تاوان‌و دوژمنایەتی ولە خوا بترسن بە بێگومان تۆڵەی خوا زۆر توندە بۆتاوانباران. ئینجا ﷲ باسی ئەو گۆشتانە دەکات کە حەرامە خواردنیان ودەفەرموێ:

(٣) حەرام کراوە لێتان گۆشتی حەیوانی مردار بوو خوێنی جاریو گۆشتی بەراز و ئەو حەیوانەی کەکاتی سەر بڕینی ناوی جگە لەخوای لەسەر ببرێتو گۆشتی حەیوانێك کە بخنكێنرێتو گۆشتی ئەوەی کە بە بەردو شتی قورس لێی بدرێت تا دەكوژرێتو ئەوەی کە لە شوێنی بەرزا فڕە بدرێتو بە کەوتنە خوارەوە بمرێتو ئەوەی کە حەیوان بە شاخ لێی بداتو بیكوژێتو ئەوەی کەوا دڕندە بیخوات مەگەر ئەمانە بگەن بەدەستو سەرببڕێن ، وە ئەو حەیوانانەی کە لە شوێنی بتەكاندا سەر ببڕێت حەرامەو گۆشتی ناخورێتو ئەوەیش کە بەقومار دابەش دەکرێن. جگە لەمردارۆ بووی ماسیو کولله. (أزلام) ئیشێکی سەردەمی نەفامی بو کە بریتیە لە سێ پارچە شتی وەکو یەك پەرداخ بێت یان شتێکی تر لە سەر یەکێکیان دەنوسی (بیکە) لەوی تریان دەنوسی (نەیکەیت) هیچیان لە سێهەمیان نەدەنوسیو دەیان جوڵاندنو داوایان لێ دەکردن کە ئەم ئیشە یان ئەم شتەمان بۆ بەش بکەنو ئەو سێ شتەیان بە تەقسیم کەر دادەنا هەندێکیش دەڵێن: لە سەر یەکێکیان دەنوسی پەروەردگارم فەرمانی پێکردوم (امر ر) لە دووهەمیان دەنوسی پەروەردگارم بەرگری کردوم (نا ر) لەسێهەمیان هیچیان نەدەنوسی، جا ئەگەر یەکەمیان بۆ دەرچوایە پەلاماری ئیشەکەیان دەداو دەیانکردو گوێیان لە حەرامو حەڵاڵ نەبو دەیان وت: بۆمان دەرچوە. وە ئەگەر دووهەمیان بۆ دەربچوایە ئیتر ئەو ئیشەیان نەدەکرد با زۆر چاکیش بوایە، چونکە دەیانوت پەروەردگارمان لێی قەدەغە کردوین جا ئەگەر ئەمانەیان بە پەروەردگار دانابێت ئاشکرایە کافر بونیان، وە ئەگەر بەوە مەبەستیان خوا بو بێت ئەوە درۆیان بە دەم خواوە کردوە خۆ ئەوانە دارێکی ڕەقو وشك یان بەردێك یان ئاسنێك یان شوشەیەك بون خۆ پێغەمبەری خوا نەبوون چۆن دەزانن خوا ئیرادەی وایە کە ئەو ئیشە بکرێت یان نەکرێت؟ ئاشکرایە چ بە خوایان بزانن یان درۆ بە دەم خواوە بکەن کافر دەبن، جا موسڵمانان نابێ بەو شێوەی ئەوان بجوڵێنەوە دەڵێن ئەگەر سێهەمیان بۆ دەربچوبایە چەند بارەیان دەکردەوە تا یان یەکەم یان دووهەمیان بۆ دەردەچوو. پێغەمبەری ئیسلامﷺ هاتوە بۆ هەر ئیشێك کە حەڵاڵ بێت، بەڵام ئەگەرکابرا نەزانێ ئەو ئیشە چاکە بۆی یان نە، بەرنامەیەکی جوانی داناوەو پێویستە موسڵمانان لەو بەرنامەیە سود وەرگرن کەئەویش بریتیە لەوەی کە کابرای دوو دڵ بو لە ئیشەکەی دوو رکات نوێژی سوننەت بکاتو پاشان بڵێ: {اللهُم إني أسْتَخِـ ُـكَ بِعِلْمِكَ وَأسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأسْألُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِيم فَإنكَ تَقْدِرُ وَلا أقْدِرُ وَتَعْلمُ وَلا أعْلمُ وَأنتَ

حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٣) يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ (٤) ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٥)

عَلامُ الغُيوبِ اللهُم إنْ كُنتَ تَعْلمُ أن هَذَا الأمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أمْري أوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أمْري وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَإنْ كُنتَ تَعْلمُ أن هَذَا الأمْرَ شَر لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أمْري أوْ قَالَ فِي عَاجِلِ أمْري وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَني وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُم رَضنِي بِهِ وَيُسَمي حَاجَتَهُ / البخارى وغ ة / ئەی خوایە داوای خەیرت لێ ئەکەم بە هۆی زانینەکەتەوە ، واتە: تۆ زانای بە سەر هەمو شتێکداو دەزانی کام چاکەو کام خراپە و داوات لێ دەکەم بە هۆی تواناییەکەتەوە واتە تۆ توانای هەمو شتت هەیەو دەتوانی ئەم شتەیش بۆ من بکەیت و دوات لێ ئەکەم لەو نازو نیعمەتە گەورەیەی کە هەتە بە ڕاستی تۆ دەتوانیو من ناتوانم و تۆ دەزانیتو من نازانم ، وە تۆ زانەری هەمو نهێنیەکانیت ئەی خوایە ئەگەر تۆ دەزانی ئەم ئیشە ـ ناوی ئەو ئیشەی کەدەیەوێت، ببات ـ بۆ ئاییینمو بۆ ژیانمو بۆ ئایندەم چاکەبینوسە بۆمو ئاسانو بە فەرو بە پیتی بکەیت بۆم ، وەئەی خوایە ئەگەر تۆ دەزانی کە خراپە بۆم لە ئاییینو لە ژینو لە ئایندەمدا لام بدەلێیو ئەویش لادە لە من و ئەوەی کە چاکە بۆم بنوسە لە هەر کوێدا ببێت لە پاشان ڕازیم بکە بەوە. جا پاش ئەم نوێژو دوعایە ئەگەر ئارەزۆی هاتە سەری با بیکات ئینشا الله سودی تێدا دەبێت. وەنابێ ئەو شتە حەرامانە بخوات، وەیان ئەو ئیشە حەرامانە ئەنجام بدات. وەئەوئیستیخارەیەش دەبێ بۆ شتێ حەڵاڵبێ. لە پاش ئەوانە دەفەرموێ: ئەوەی کە باسکرا بۆ ئێوە هەموی لادانە

له حدودی خوا ئەمڕۆ ئیتر کافرەکان نا ئومید بون له دینەکەتانو کەس ناتوانێت بیروخێنێت ولەناوی ببات ئەمەش موژدەیەکی گەورەیە بۆ موسڵمانان. کەوابو لەوان مەترسنو له من بترسن کەمن ئەمڕۆ تەواوم کردوە بۆتان دینەکەتانو نیعمەتی خۆمم تەواو کرد بۆتانو رازیم لێتان کە ئیسلام دینتان بێت. بەڵێ ئەوانە حەرامنو نابێ بخورێن مەگەر له ناچاریدا وەك دەفەرموێ: ئینجا هەر کەسێك کە ناچار بو لە برسا بۆ خواردنی یەکێك لەو حەرامانە ئەوە با بەئەندازەی لابردنی برسیەتیەکەی بخوات بەو مەرجەی مەیلی گوناح نەکاتو زیاتر له پێویستیش نەخوات ، وە ئەگەر نەفسو شەیتانی خەڵەتاندیو زیادەڕەوی کرد، ئەوسا بێگومان کەاللە لێبوردەو بە سۆزە بۆیانو چاوپۆشیان لێ دەکات. ئەمەش گۆشەیەکی ترە لە سۆزە بێ سنورەکەی خوا بەرامبەر بە بەندەکانی کەئەو حەرامانەی بۆ حەڵاڵ کردوە له کاتی پێویستدا. بەراستی ئەم ئایەتە خوشترین مژدەیە و رۆژی دابەزینیشی گەورەترین جەژنی موسڵمانانە. خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ المائدة: ٣| ئەمڕۆ دینەکەم بۆ تەواو کردن﴾ ئوبەیەی کوری کەعب وتی: ئەگەر ئەم ئایەتە بۆ گەلێکی تری بێجگە لەم گەلە بهاتایە زۆر چاك لەو رۆژە ورد دەبونەوەو دەیان کرد بە جەژن بۆ خۆیانو کۆ دەبونەوە تێیدا. عومەر وتی: کام ئایەت ئەی ئوبەی؟ وتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ عومەر وتی: بە راستی ئەو رۆژەو ئەو جێگایە دەزانم کە تێیدا دابەزیوە لە رۆژی جومعەو لە رۆژی عەرەفەداو لەعەرەفات دابەزیوە سوپاس بۆ خوا هەردووکیان جەژنمانە (تەبەری). جا لەم ئایەتە پیرۆزەدا دوو وشەی (اكمال_وا ام) بە کار هاتوە کە یەکەمیان: جوانیو رێكو پێکی دەگەیەنێتو دووهەمیان: تەواویو بێ کەمو کوری دەگەیەنێت. واتە: هەم جوانو رێكو پێکەو هەم تەواوەو هیچ کەمو کوریەکی تێدا نیە، مادەم وایە دەی نابێ رێگەو رێبازێکی تر دابنرێت بۆ نەوەی ئادەم چونکە یەکەم: دەست درێژیە بۆ مافی خوایەتیو دووهەمیش: خەڵەتاندنی خەڵکە، چونکە کەس ناتوانێت یاسایەکی ئاوا رێكو پێكو تەواو دابنێت دەی بۆ سەری لێ تێك دەدیتو نایەڵێ ئەو رێبازە چاکەهەڵبژێرێت؟ هەروەها ئەم ئایەتە رێگا نادات بە زیاد کردنی ئایین یان کەم کردنەوەی، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي﴾ دەی کە رێكو پێكو تەواوە ، ئیتر چۆن دەبێ لێی زیاد بکەیت ئەمەش دەمکوتێکی توندە بۆ بیدعەچیەکان، چونکە شتێك لە زەمانی پێغەمبەری خواداﷺ دین نەبوبێتو نەکرا بێتو نەوترا بێت ئیتر چۆن دەبێ ئێستە دین بێت؟! ئەگەر ئەوان نەیان کرد بێ یان نەیان وتبێ دووشت دەگەیەنێت کە هەردووکیان یەك لەیەك خرابترن یان ئەوەیە کە پێغەمبەرﷺ نەیزانیوە چاکە، یان زانیویەتیوبەئێمەی نەوتوە کە ئەمەش شاردنەوەو کەتمانەو خیانەت کردنە بە ئۆمەتو دژی تەواو بونی رسالەتی پێغەمبەرەﷺو دژی ئەو هەمو فەرمودانەی پێغەمبەرەﷺ کە یەکێك لەوانە ئەمەیە کە بوخاریو مسلم ریوایەتیان کردوە کە دەفەرموێ: {مَنْ أَحْدَثَ فِي أَمرِنَا هَذَا مَا لَيسَ فِيهِ فَهُوَ رَد / هەر کەسێك لەم ئیشەی ئێمەدا کە ئیسلامە شتێك دابهێنێت ولەودا نەبێت ئەوە وەرناگیرێت} وە لە فەرمودەیەکی تردا کە مسلم ریوایەتی دەکات دەفەرموێ: {مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيسَ عَلَيهِ أَمرُنَا فَهُوَ رَد/ هەر کەسێك ئیشێك بکاتو فەرمانی ئێمەی لە سەر نەبێت ئەوە وەرناگیرێت} وە چەندین فەرمودەی ترمان لەو بارەوە هەیە ئاوا بە زەقی بیدعە هەڵدەوەشێنێتەوە، بەڵام ئەوانەی کە شەیتان سەری لێ شێواندون و دوکانێکی گەرمیان هەیە بەهۆی رەواجدانی بیدعەوە بەو هەمو فەرمودەراستانە بروا ناکەنو بە هەندێ بەڵگەی خەیاڵیو خەوی فلانوفیسارەوە خۆیانو خەڵکیش ماڵ وێرانو شەرمەندەی پێشگای اللّٰه دەکەن؟! برام خۆ ئەگەر سونەتیش بن ئەگەر ئەنجامیان نەدەیت هیچ گوناهت ناگات ئەی ئەگەر بیدعە بێت چ جوابت هەیە؟ بیر بکەرەوەو سەر لە خۆتو خەڵکیش تێك مەدە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {كُل مُحدَثَةٍ بِدْعَةٌ وَكُل بِدْعَةٍ ضَلالةٌ وَكُل ضَلالَةٍ فِي النار /اصحاب السن وغ هم/ هەمو داهاتوەیەك بیدعەیەو هەمو بیدعەیەکیش گومڕاهیەو هەمو گومڕاهیەکیش لە ناو ئاگردایە} پێشەکی با بیدعە بناسین بیدعە لە ناو زمانی عەرەبیدا بە مانای شتی جوان هاتوە ئیتر بووبێت لە پێشەوە یان نەبوبێت سونەت بێت یان فەرز بەڵام لە شەرعدا مەبەست پەیدا بوونو کردنی شتێکە کە لە پێشەوە نەبوبێت ونەکرا بێتو نەوترابێت لەبیروباوەڕو لە بەندایەتیدا ، جا ئەم جۆرە بیدعەتەیە کەئیسلام ئاوا هەڕەشەی لێ دەکاتو بەڵێنی سزای سەختی داوە بۆ ئەو کەسانەی کە دایهێننو بیکەن هەروەکو لەو حەدیسانەی پێشەوە باسکران، بەڵام جێگای داخە ئایینی راستەقینەی ئیسلامو ئەو بەرنامە جوانەی پێغەمبەری خواﷺ لە خەڵك شاراوەتەوەو دەشارێتەوەو شتانێك کە هیچ بەڵگەیەکی شەرعیان لە سەر نیە کراوون بە سونەت بەڵکو بە فەرزیش لە روانگەی خەڵکی نەزانو تێ نەگەیشتو لە ئیسلامداو سەدان سونەتو دەیان فەرز واز لێ دەهێنێتو هیچ قاڵێکی لە سەر نابێت، کەچی بە یەکێك لەو بیدعەتانە وترا: شەرعی نیە ئاسمان دەکەوێتە سەر زەویو دارو بەردی لێ دێتە سەر پێو کابرای رۆشنکەرەوە بەر دەیان تانەو تەشەرو ناوەی جۆراو جۆر دەکەوێت، بەڵام ئەوەی راستی بێت ئەوەیە کە پەیڕەوانی

ڕاستەقینەی ئەم دینە هەمیشەکەم بونو هەتا قیامەتیش هەروا بە کەمی دەمێننەوە وەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ/ رواه مسلم والنسائی/ دین بە غەریبی هاتووە هەرواش دەست پێ دەکاتەوە بە غەریبی ، جا خۆشبەختی بۆ ئەوغەریبانە}

چونکە ئێمە لە پێشەوە لە سەر ئایەتی (١١٧/سورەتی بقرە ) لەم بارەوە هەندێك قسەمان کردوە بەمە کۆتایی بەم باسە دێنین، بەڵام لێرەدا سرنجی خوێنەران ڕادەکێشین بۆ وەڵامی سێ پرسیار:- یەکەم - وتراوە کۆکردنەوەی قورئان بیدعەیەو ئیشی پێ کراوە. دووهەم - عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) تەراویحی کرد بە جەماعەتو وتی: (نعمت البدعە هذه/ ئەمەبیدعەیەکی چاکە)

سێهەم: فەرمودەی: (من سن سنة) بۆ یەکەم دەڵێین: ئەگەر قورئان نەنوسرابوو (٤٠) چل نوسەری وەحی چیان دەکرد بۆ پێغەمبەر ﷺ؟ قورئانی (حفصە) چی بو؟ بۆ وەڵامی دوهەم دەڵێین: جەماعەتی یەکەمو دووهەمو سێیەمی پێغەمبەرﷺ بۆ تەراویح بەس نیە کە سونەت بێت؟ وشەی (نعمت البدعة)ی عومەر با مانای زمانەوانیە، ئەی دەگونجێت عومەر نەیزانیبێت کە پێغەمبەری خواﷺ ئەو سێ شەوە جەماعەتی تەراویحی کردوە لە گەڵ ئەوەدا کە عومەر خۆی دەڵێت: بۆیە پێغەمبەرﷺ وازی لە بەجەماعەت کردنی نوێژی تەراویح هێنا چونکەدەترسا فەرز بێتو خەڵك نەتوانن ئەنجامی بدەن، دەی خۆ ئێستا پێغەمبەرﷺ نەماوەو تازە وەحی نایەتو هیچمان لە سەر واجب نابێت، جا با بە جەماعەت بیکەینەوەو ئۆبەیەی کوڕی کەعبی کرد بە ئیمامی نوێژی تەراویح بۆ موسڵمانان، دەی ئەمە سوننەتە نە بیدعەکەی جەنابت. لە وەڵامی سێهەمدا: دەڵێین: براکەم جوان تەماشا بکە بزانە حەدیسەکە لە سەر چی وتراوەو ڕوداوەکەی بزانەو لە وشەی (سنة حسنة _سنة سيئة) تێ بگەو سونەت دەبێ شێوەکەی وترا بێت یان کرا بێت ئینجا پێی دەوترێت سونەت قورئانو پێغەمبەرمانﷺ چەندین جار فەرمانی چاکە کردنیانی داوەو وا ئێستاش کابرایەکی فەقیری جلو بەرگ دڕاو دێتە خزمەت پێغەمبەرﷺو پێغەمبەرﷺ کە چاوی پێ دەکەوێت دڵی بۆ فەقیریو نەداری ئەو ئاگر دەگرێتو داوا لە موسڵمانان دەکات کە یارمەتی بدەن ئەوە بو کابرایەکی موسڵمانیش یەك کیسە پارەی زۆری هێناو دایناو خەڵك کە دیتیان بە شوێن ئەودا هەرکێ چی توانی کردیو کۆمەڵێکی باش پارە لە بەردەم پێغەمبەری خواﷺدا هەڵدرایەوەو دڵە بە سۆزەکەی پێغەمبەر ﷺ فێنك بویەوەو ناوچاوانی وەکو زێڕ بریسکەی دەدا لە خۆشی ئەوەی کە کرا سەبارەت بەو موسڵمانە فەقیرەو مۆژدەی گەورەی بە یەکەم چاکە کەر داو فەرموی (من سن سنة حسنة) ئایا ئەمە لە گەڵ بونی دەیان ئایەتو حەدیس سەبارەت بە داوا کردنی چاکەو فەرمانی ڕاستەوخۆی ئەو کاتەی پێغەمبەریش ﷺ بەوان، دەکرێت ئەمە بیدعە بێت تا تۆ بیدعە ناپەسندەکەی خۆت قیاس بکەیت لە سەر ئەو سونەتە؟! و (من سن سنة سيئة) ئەویش هەر بەم شێوەیە کەسێك ڕەوشتێکی خراپەی کۆنی مردوو زیندو بکاتەوە دیارە پاش ئەو هەتا ڕۆژی قیامەت کێ بەو ڕەوشتە ناشیرینە ئیش بکات ئەوە ئەو زیندو کەرەوە بەشدار دەبێت لە تاوانەکەیدا بۆنمونە: ئیسلام هات ئافرەتی لەروتیو بەرەڵای قەدەغەکردو دایکانی ئێمە زیاتر لەهەزارو سێ سەد ساڵە بە شانازییەوە ئەو فەرمانەیان بەرێكوپێکی جێبەجێ کردوە ، جا لە پاش ئەوە یەکەم ئافرەتێکی بەناو موسڵمان سەرولاقی خۆی دەرخستو ئەو سوننەتە خراپەی زیندو کردەوە جا ئەوئافرەتە بەشدارە لەتاوانی سەرو لاق ڕوتانی پاش خۆی هەتا قیامەت. بەڵام ئەم جۆرە بیدعەیەی کە بە بیدعەی (حسنة)ی ناو دەبەن ئەمەیە پڕ مەترسی، چونکە وەك وتمان: بەڵگەی نەزانینی پێغەمبەرەﷺ یان زانیویەتی بەڵام شاردویەتیەوە؟! کە پاڵدانی ئەو دوو شتە ئەڵای پێغەمبەرﷺ تاوانێکی ئێجگار گەورەو پڕ مەترسیەو مرۆڤ بەرەو هەڵدێرو شەرمەزاریو سەرشۆڕی قیامەت دەبات ، جا لە بەر هەست بەو مەترسییە گەورەیە بۆیە ئێمەش ئەوەندە بە پەرۆشین بۆ چاك کردنی بیرو ڕای براو خۆشکانی هاوزمانمان. ئەمەیە ڕاو بۆ چونمان سەبارەت بە بیدعە بە کورتی جائەگەر پێکابێتمان منەت هی خوایەو هەر خۆی ڕێنمای کەرە، وە ئەگەر بە هەڵەداچوبین تاوانی خۆمەو داوای چاوپۆشی لە اللهدەکەم ، ئینجا اللهبۆ زیاتر ڕۆشنکردنەوەی موسڵمانان سەبارەت بە حەرامو بە حەڵاڵ درێژە بە بەیان کردن دەدات وچەندین شتی ترمان بۆ باس دەکات لەوانە ئەو نێچیرانەی کە بە هۆی سەگی فێر کراوو بازو شتی ترەوە ڕاو دەکرێنو خاوەنەکەیان بە مردویی دەچێتە سەریانو دەفەرموێ :

(٤) ئەی محمدﷺ پرسیارت لێ دەکەن چ شتێك حەڵاڵە بۆیان بڵێ: هەمو شتە پاکەکان حەڵاڵ کراوە بۆتان کەواتە ئەوەی کە حەڵاڵ نیە لە بەر ئەوەیە کە پاك نیە. ئینجا دەفەرموێ: وە حەڵاڵە شکاری ئەوەی کە فێرتان کردوەو مۆچاندوتانە لە برین کەرەکان کەخۆتان ماندو کردوە بە فێر کردنیێو فێرتان کردوە وەك الله ئێوەی فێر کردوە،واتە: وەك خۆتان چۆن لە مانای بڕۆو بیگرەو ڕاکەو نەی خۆیت تێدەگەن ئەوانیشتان هەر بەو شێوەیە فێر کردوە، جا خوا دەفەرموێ: ئەو حەیوانە فێر کراوانە هەرچیان بۆ گرتنو لە ژێر دەستیاندا مردن بیخۆنو زیکری خوای لە سەر بکەن و بڵێن: (بسم ا ) جا ئەگەر کابرا سەگێکی هەبوو پێی وت: بڕۆ ڕۆیشت ئەو کاتە ئەو سەگە بە فێرکراو

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ
وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ
وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ
وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ
أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا
فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ
لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ
وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٦﴾
وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم
بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ
ٱلصُّدُورِ ﴿٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ
شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ
أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ
ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿٩﴾

دادەنرێت ئەگەر ئەو سەگە بە کەیفی خاوەنی نەچو ئەوە فێر کراو نیەو مردار بوی ناخورێت، واتە: پێویستە ئەم سێ مەرجەی تێدا بێت: **یەکەم** ـ حەیوانی راوچی ئەبێ فێرکراو بێت. **دووەم** ـ ئەو حەیوانە رەوانە کرا بێت بۆ ئەو نێچیرە.

**سێهەم** ـ فێر کردنی وابێت کە رۆیشتنو گەڕانەوەی بە فەرمانی کابرای نێچیرەوان بێت ئەو کاتە ئەگەر شتێکی گرتو لە ژێر دەستیا مرد بەر لەوەی خاوەنەکەی بیگاتێ حەڵاڵە خواردنی. ئینجا دەفەرموێ: لە خوا بترسن ، بێگومان کە الله زۆر زۆر بە پەلەیە لە موحاسەبە کردنی بەندەکانیداو ماوە نادرێت بە تۆبە کردنو پەشیمان بونەوە لەو کاتەدا. ئینجا دەفەرموێ:

(٥) لە ئەمڕۆوە حەڵاڵ کراوە بۆ ئێوە شتە چاکەکانو خواردەمەنی ئەو کەسانەی کە خاوەنی کتێبن بە ئیزنی خاوەنەکەی رەوایە بۆتانو خواردنی ئێوەش رەوایە بۆ ئەوانو رەوایە بۆتان ئەو ئافرەتانەی کە پاك داوێنو بێ هاوسەرن لە ئیماندارانو ئەو ئافرەتانەی کە پاك داوێنن لە ئەهلی کتێب ، واتە: ئافرەتێکی پاك داوێنی یەهودی یان مەسیحی دروستە پیاوی موسڵمان بیخوازێت ، بەڵام دروست نیە ئافرەت بەوان بدەین، لەوانەیە لێرەدا رەخنە بگرنو بڵێن چ جیاوازیەك هەیەو بۆ ئێمە دەتوانین ئافرەتی ئەهلی کتێب بهێنین، بەڵام نابێ ئافرەتی موسڵمانیان پێ بدەین؟ دەڵێین: جیاوازی لەوەدایە ئەو ئافرەتە ئەگەر جولەکە بێت رێز لە عەقیدەو بیرو باوەڕی دەگیرێتو دەتوانێت ئازادانە بە گوێرەی بیرو باوەڕی خۆی بەندایەتی خوا ئەنجام بداتو هەر کاتێ ناوی موسا ببات ئێمە دەڵێین (**علی نبینا وعلیه السلام**)

وە دەتوانێت تەوراتی خۆی تەماشا بکاتو سودی لێ وەربگرێت، هەروەها ئەگەر ئەو ئافرەتە گاور بێت بۆی هەیە ئازادانە بیرو باوەڕی خۆی دەربڕێتو بەندایەتی خۆی ئازادانە ئەنجام بدات و هەر کاتێکیش ناوی عیسا ببات ئێمە دەڵێین: (**علی نبینا وعلیه السلام**) کەواتە ئەوانە لە لای ئێمە هیچ شتێك ئازاریان نادات‌و سەربەرزانە ژیانی خۆیان دەبەنە سەرو رۆژێك لە رۆژان زۆریان لێ ناکرێت لە سەر ئیسلام بوون بەڵام ئافرەتی ئێمە ئەگەر بەوان بدرێت هیچ کام لەو ئازادیانەی نابێتو کاتێك کە ناوی پێغەمبەرﷺ بهێنرێت گاڵتەو لاسایی دەکرێتەوەو قورئانیشی بۆ ناخوێندرێت بە ئاشکرایی‌و جا دەبێت هەتا دەمرێت هەروا بە سەر شۆڕی‌و ترسو لەرزەوە ژیان بباتە سەر یان واز لە عەقیدەو بیرو باوەڕەکەی بهێنێت کە لە لای خواو پاشان پێغەمبەرەکەیﷺ ئینجا لە لای خزمانی سەر شۆڕو شەرمەندە بێت ئایا ئەمە عاقڵانەیە کەئەم ئافرەتە ئاوەهایی لەگەڵدا بکرێت؟ وە ئایا جیاوازی هەیە لەم جیاوازیە پڕ مەترسی تربێت؟ بەڵێ ئێمە بۆمان هەیە ئافرەتی ئەهلی کتێب بخوازینو مافی خۆی پێ بدەین وەك دەفەرموێ: هەر کاتێ مارەییەکانتان پێدان ئینجا رەوایە بۆتان دیسان دەبێ ئەو پیاوە موسڵمانە پیاوێکی راستو دروست بێتو ژن هێنانی بە لاوە کارێکی جوانو مەردانە بێت وەك دەفەرموێ: داوێن پاك بن‌وزینا کار نەبنو دۆستی ژێر بە ژێری نەگرن ، لێرەدا الله خاوەن باوەڕان دەترسێنێت لە کوفرو پاشگەز بونەوە واتە نەکەن بە هۆی تێکەڵاو بونتانەوە خۆشەویستی بێ باوەڕان بچێتە ناو دڵتانەوە یان بە هۆی خۆشویستنی ئافرەتێکی بێ باوەڕەوە بۆ ئەوەی دەستتان بکەوێت بیرو باوەڕەکەی خۆتان لە دەست بدەنو دەفەرموێ: وە هەر کەسێك پاش باوەڕ هێنان بێ باوەڕ ببێت ئەوە بە راستی هەمو کردارو رەفتارە چاکەکانی پێشوی هەڵدەوەشێتەوەو لە رۆژی دوایشدا لە ڕیزی رەنجەڕۆیانو زیان لێ کەوتوانە ئینجا الله یاسایەکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٦) ئەی خاوەن باوەڕان هەر کاتێك کە هەڵسان بۆ نوێژ ئەگەر دەست نوێژتان نەبو یان هەروویستتان دەستنوێژبگرن دەمو چاوتان بشۆنو دەستەکانتان بشۆرن هەتا ئەنیشکەکانو دەستی تەڕ بە سەرتاندا بهێننو پێیەکانتان تا دەگاتە قاپەکانتان بیشۆرن. لێرەدا دەرکەوت کە ئەم چوار شتە پێویستە:

یەكەم ـ شۆردنی دەمو چاو. دووهەم ـ شۆردنی هەردوو دەست تاكو ئەنیشك. سێهەم ـ مەسحی سەر. چوارەم ـ شۆردنی هەردوو پێ تا قوڵەپێ بە گوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ كە دەفەرموێ: {وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ/متفق عليه/ وای بۆ پاژنەكان لە ناو ئاگردا}چونكە كەچاكی ناشۆرن، كە رونترینو بە هێزترین بەڵگەیە لە سەر شۆردنی پێ لە كاتی دەست نوێژ گرتندا. ئەوسا نیەتیش پێویستە، لەبەر فەرمودەی: {إِنَّمَا الْأَعْمَالُ بِالنِّيَاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى/متفق عليه / كرداره باشەكان بە نیەتەكانیانەو هەمو مرۆڤێك نیەتەكەی بۆ هەیە} ئینجادەفەرموێ: وە ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون یان لە سەفەردا بوون یان یەكێك لە ئێوە دەستی گەیاند بە ئاو یان لەژنانتان كەوتن، جا بۆ دەستنوێژ ئاوتان دەست نەكەوت ، ئەوسا خاكێكی پاك هەڵبژێرنو بەو خاكە پاكە تەیموم بكەن ، جا دەستەكانتان لە دەمو چاوتان دەدەن بەو خاكە پاكە واتە: هەردوو لەپی دەستت ئەدەی لەو خاكە پاكەو بە دەمو چاویا دێنیتو جارێكی تر كە دەستتان لەو خاكە پاكە دەدەنو بە بەری دەستی چەپتاندا بە دەستی راستاندا دەهێنن تا موچ یان تا ئەنیشك، ئینجا بەری دەستی راستیش بەو شێوەیە دەهێنن بە دەستی چەپتاندا، لە سەر ئەمە ناڕێكی بوە لە نێوان زانایاندا وەكو مانامان كرد هەندێك دەڵێن: مەسحی دەست تا موچە، وە هەندێكی تریش دەڵێن: تاكو ئەنیشكە تەنانەت قسەی تا بن دەستیش كراوە، بەڵام نزیكترین تاكو ئەنیشكە هەر خوایش زانایە. الله نایەوێت كەئێوە بكەونە ناو سەختیەوە بەڵكو ئاسانكاری بۆ ئێوە دەوێتو ئەو شۆردنە بە قازانجتانە وەك دەفەرموێ: بەڵام خوا دەیەوێت ئێوە پاك بكاتەوە، واتە: الله دەیەوێت بەم دەست نوێژە ئێوە پاك بكاتەوە چ پاكی پۆشاكو جێگاو لەش بێت چ پاكی ناو دەرون بێتو چ پاك كردنەوەی لە تاوانو خراپە بێت كە الله بە هۆی نوێژەوە هەموومانمان بۆپاك دەكاتەوە، پاكو خاوێنی جلو بەرگو لەشمان شتێكی ئاشكرایەو بەڵگە نەویستە بەڵام بۆ پاك كردنەوەی دڵو دەرونمان خوالەئایەتی بیستوهەشتی رەعد دا دەفەرموێ: ﴿ ئەوانەی كەباوەڕیان هەیەو بە یادی خوا دڵەكانیان ئارام دەگرن ، با بزانن هەر بە یادی خوا دڵەكان ئارام دەگرن﴾ دەی كام یاد كردنەوەی خوا هەیە گەورەتر بێت لە نوێژ كردن؟ وە بۆ پاك كردنەوەی كرداره خراپەكانمان چەندین فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ هەیە یەكێك لەوانە ئەم فەرمودەیە كە دەفەرموێ: {إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ أَوْ الْمُؤْمِنُ فَغَسَلَ وَجْهَهُ خَرَجَ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ خَرَجَ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ كَانَ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلَاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنْ الذُّنُوبِ /رواه مالك مسلم / هەر كاتێك بەندەیەكی موسڵمان یان باوەڕ دار دەمو چاوی شورد بۆ دەستو نوێژ گرتن هەمو ئەو تاوانانەی كەبەچاوەكانی كردویەتی دەچێت یان لە گەل ئاخر تكەی د وە هەركاتێك هەردوودەستی شۆرد هەمو ئەو تاوانانەی كە بە دەستی كردویەتی دەچێت یان لە گەل ئاخرتكەی داو هەر كاتێك هەردوو پێی شۆرد هەمو تاوانێك كەبە قاچەكانی بۆی چوە ئەچێت یان لە گەڵ دوا تكەی ئاوەكەدا دەڕوات تا وای لێ دێت كە لە هەمو گوناهێك پاك دەبێتەوە} كەوا بو الله دەیەوێت بەم عیبادەتە گەورەیە لە هەمو خراپیەك پاكمان بكاتەوەو شایستەی بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەكەی ببین كە تەواوی نیعمەتەكان لەوێدا دەست دەكەون بۆیە دەفەرموێ: وە تا تەواو بكات بۆتان نیعمەتەكانی خۆی بەڵكو ئێوەش سوپاسی ئەو خوا گەورەو بەخشندەو بە سۆزە بكەن. لەوانەیە لێرەدا بڵێن بەڵێ ئاو لەشمان پاك دەكاتەوە ئەی خاك خۆ ئەوە تۆزاویو پیسمان دەكات؟ دەڵێین یەكەم: ئەمە بەندایەتیەو گوێ رایەڵی كردنو ئەنجامدانی فەرمانەكان بێ ئەم لاو ئەو لا پێویستە لە سەرمانو بەوە راستو ناراست دەردەكەوێت. دووهەم: خاك لە پاش ئاو پاكو خاوێن كەرەوەیەكی زۆر زۆر گرنگو بە نرخەو ئەگەر خاك میكرۆبی لە ناو نەبردایە هەر زۆر لە مێژ بو مرۆڤ كۆتایی هاتبوو بە بۆنەی پیسی خاكەوە تەنانەت هەندێ میكرۆب كە بە ئاگر لە بەین ناچێت بە خاك لە ناو دەچێت وەكو ئەو میكرۆبەی كە لە دەمی سەگو پیسی پشیلەدا پەیدا دەبن ئەوەتە پێغەمبەرمانﷺ بۆ پاك كردنەوەی جێگا دەمی سەگ دەفەرموێ: حەوت جار بیشۆرن جارێكیان بە خاك ، وەخوا خۆی پشیلەی وا تێگەیاندوە ئەبێ پیسی خۆی بشارێتەوەو خۆڵی بە سەرا بدات ﴿سبحان الذی قدر فهدی﴾ جا كەوا بو بە ئەو فەرمانانەی خوا هەموی نیعمەتن بۆ ئێمەو پێویستە سوپاسی بكەینو لە بیرمان نەچێتەوە وەك دەفەرموێ:

(٧) بیر كەنەوە لەو نیعمەتانەی خوا كە بە ئێوەی داوە گەورەترینیان رەوانە كردنی پێغەمبەرمانەﷺ و رونكردنەوەی رێگای راستە بۆمانو حەڵاڵ كردنی پاكەكانو قەدەغە كردنی شتە پیسەكانە، وە ئەو پەیمانە بتەوەی كە ئێوە بۆ بەرگری لە ئایین بەستوتانە، كەی؟ ئەو كاتەی كە وتتان: بیستمانو بە گوێمان كردیت ، جا دەگونجێت ئەو پەیمانە بێت كە پێغەمبەرمانﷺ كاتی خۆی وەری گرت لە كۆمەڵی یەكەمی موسڵمانانی مەكەو بەڵێنیان پێدا كە گوێ بۆ بگرنو پەیرەوی بكەن یان ئەو پەیمانە بێت كە موسڵمانانی مەدینە بە پێغەمبەریانﷺ داو ناونران یارمەتی دەر (الانصار) یان ئەو پەیمانە بێت كە لە ئاشتی كردنی

وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَلَقَدْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا ۖ وَقَالَ اللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ۖ لَئِنْ أَقَمْتُمُ الصَّلَاةَ وَآتَيْتُمُ الزَّكَاةَ وَآمَنْتُمْ بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ اللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَأُكَفِّرَنَّ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۚ فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنْكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَاءَ السَّبِيلِ ﴿١٢﴾ فَبِمَا نَقْضِهِمْ مِيثَاقَهُمْ لَعَنَّاهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَاسِيَةً ۖ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَنْ مَوَاضِعِهِ ۙ وَنَسُوا حَظًّا مِمَّا ذُكِّرُوا بِهِ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَائِنَةٍ مِنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِنْهُمْ ۖ فَاعْفُ عَنْهُمْ وَاصْفَحْ ۚ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣﴾

حودەیبیەدا بەڵێنیان دا بە پێغەمبەر ی خواﷺ شەڕ بکەن تاکو مەرگ ، یان ئەو پەیمانە بێت کە کاتی خۆی لە پشتی ئادەم دا دایان بە خوا، ئەو کاتەی کە خوا فەرموی: ﴿ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟﴾ هەمو وتیان بەڵێ تۆ پەروەردگاری ئێمەی. واتە: بیر لەو بەڵێن وبڕیارانەتان بکەنەوەو نەیان شکێنن‌و لە خوا بترسن بەبێگومان کە الله زانایە بەو شتانەی کە لە ناو دڵتاندایەو هیچی لێ حەشار نادرێت چونکە خۆی وردو کردی ناودڵەکان دروست دەکات ئیتر چۆن دەبێ نەزانێ بەو وردو کردەی ناو دڵان؟ جارێکی تر هەم رودەکاتە خاوەن باوەڕان‌و دەفەرموێ:

(٨) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئێوە لە بەر خاتری الله رابوەستن لە سەر قسەی راست وبائیشتان لە بەر خاتری الله بێت ، وە با بە عەداڵەتو دادپەروەری شایەتی بدەن، واتە: پێویستە دادپەروەر بین لە شایەتیداو ئیشێك ئەگەر هەڵە بو نابێ ببن بە شایەت لە سەری. دەڵێن جارێکیان یەکێك لە یارەکانی پێغەمبەرﷺ بەشێ لە ماڵەکەی خۆی بەخشی بە کوڕێکی کە ناوی نوعمانی کوڕی بەشیر بو خێزانەکەشی وتی: من رازی نیم بەو ماڵە کە دەیبەخشی بەو کوڕەم تاکو پێغەمبەری خوا ﷺحازر نەبێت. وا دیارە کە چەند کوڕێکی تری هەبوە لە ژنێکی تری‌و ئەم ژنەی بۆیە شایەتی پێغەمبەری ﷺپێ خۆش بوە تا لە دواییدا قەیو قاڵی لە گەڵدا نەکەن ئێنجا پێغەمبەرﷺ ئاگادار کراو تەشریفی هێنا بۆ ماڵی کابرا، کابراش وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەم ماڵەم بەخشیوە بەم کوڕەم، پێغەمبەریشﷺ فەرموی: ئایا بە هەمو منداڵەکانت ئاوەها ماڵت پێ بەخشیون؟ کابرا وتی: نەخێر، پێغەمبەرﷺ فەرموی: {لَا تُشْهِدْنِي عَلَى جَوْرٍ /منفق علیه/مەمکە بەشایەت لەسەرستەم}لە خوا بترسەو عەداڵەت بە کار بهێنە لە ناو منداڵەکانتاندا، ئینجا لە پاش ئەم قسەیە پێغەمبەری خواﷺ هەڵساو نوعمان دەڵێ: باوکم پەشیمان بویەوە لەو بەخشینەی ، جا پاش ئەوەی فەرموی کەبۆ خوا ئیش بکەن‌و شایەتی دادپەروەرانە بدەن دەفەرموێ: ئەوسا هەرگیز رق‌و دوژمنایەتی لە تەك گەلێك دا واتان لێ نەکات کە داد پەروەر نەبن بەڵکو دەبێ دادپەروەر بن هەرچەند ئەو گەلەشتان خۆش نەوێت چونکەئەو دادپەروەریە نزیکە لە تەقواوەو لە خوا بترسن بە راستی خوا ئاگادارە بەوەی کە ئێوە دەی کەن. ئاوەها خوا مۆرێکی بە هێز دەچەسپێنێت بە کۆتایی بڕیارەکەیەوە تا خەڵك وریا ببێتەوەو خۆی لە تاوان بپارێزێت.

(٩) خوا بەڵێنی داوە بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە کەبۆ ئەوان هەیە لێخۆشبون‌و پاداشتێکی گەورەش.

(١٠) خۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە کە گەورەترینیان قورئانە ئەوانە رەفیق‌و دۆستی دەستەملی ئاگری جەهەنەمن. دووبارە اللهرو دەکاتەوە خاوەن باوەڕان‌و دەفەرموێ:

(١١) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە بیر بکەنەوە لەو نیعمەتەی الله کە ڕژاندی بەسەرتاندا ئەو کاتەی کە گەلێك ویستی دەست درێژی بکاتە سەرتان جاالله دەستی ئەوانی گرت لە ئێوەو لە خوا بترسن ، وە با باوەڕداران تەنها بە خوا پشت ببەستن و پشت بە کەسی تر نەبەستن. ئەوە بو کە لە حودەیبیەدا سەد سوار خۆیان ئامادە کرد کە بێن بدەن بە سەر پێغەمبەری خواﷺدا بەڵام الله کارێکی وای کرد کە ئەوان هەمویان لەلایەن موسڵمانەوە بەدیل گیران. هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەمە سەبارەت بە (بـ نضر ) دابەزیوە، وەختی ویستیان بەرداشێك بخەن بە سەر پێغەمبەردا کاتێ کە تەشریفی بردە لایان کە یارمەتی بدەن سەبارەت بە خوێنی دوو کەسی (عامری) جا ئەوان لەو کاتەدا عەمری کوڕی جەحاشی کوڕی کەعبیان کرد بە لێپرسراوی ئەو کارەو وتیان: ئەگەر پێغەمبەرﷺ دانیشت لە ژێر ئەو دیوارە داو کۆبونەوە لێی ئەو بەرد ئاشە لەسەربانەوە بدە بە سەر سەریا ، الله ئاگاداری کردەوە لە سەر ئەو گفتو گۆو بڕیارانە، ئێنجا پێغەمبەرﷺ گەڕایەوە بۆ ناو شارو یارەکانیشی

دوای کەوتن‌و بە دوای ئەم روداوەدا خوای گەورەو دانا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە :

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ .. الايه ﴾ جا پاش ئەوەی کە ﷲ داوای لە بڕوا داران کرد کە بەڵێنەکانی خۆیان بدەنە سەرو باسی ئەو نیعمەتانەی کرد کە داویەتی پێیان وا باسی جولەکەو گاور دەکات کە چونکە هەمو پەیمان‌و بەڵێنیان شکاند ئیتر بەر تانەو نەفرینی خوا کەوتن‌و گوێیان کەڕ بو لە بیستنی راستی‌و چاویان کوێر بو لەو هەمو بەڵگە رۆشنانەو دڵیان بێجگە لە نەفامی‌و نەزانین هیچی تری وەرنەئەگرت‌و دەفەرموێ:

(١٢) بەراستی ﷲ پەیمانی وەرگرت لە کوڕانی ئیسرائیل‌و فەرموی: ئەوە دوانزە سەرکردەو سەرپەرشتمان لێ هەڵبژاردن‌و فەرموی: من لە تەك ئێوەدام‌و یارمەتیتان دەدەم ئەگەر ئێوە نوێژەکانتان بە رێك وپێکی ئەنجام بدەن‌و زەکات بدەن‌و باوەڕ بێنن بە پێغەمبەرەکانم‌و دژایەتی هیچیان نەکەن‌و رێزیان لێ بگرن بەپەیرەوی کردنیان ئەگەر شتتان لە بەر خاتری خوا بەخشی بە تایبەت لە پێناوی بلاو کردنەوەی ئایینەکەیدا ، با دڵنیا بن کە ئێمە هەمو گوناهەکانتان لە سەر لادەبەین‌و پاکتان دەکەینەوەو بە دڵنیاییەوە لە رۆژی قیامەتیشدا دەتان خەینە ناو بەهەشتانێکەوە کە لە ژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگە بە هەمیشەیی دەڕوات ، جا هەر کەسێك لە ئێوە کافر بێت پاش ئەم هەمو راستیانەی کە بۆتان رۆشن کرایەوەو دوای ئەم هەمو داستان‌و ئامۆژگاریانەی کەبیستتان، جا بە راستی ئەو کەسە راستە رێگای لێ ون بوەو کەوتوەتە لاڕێ. جابیری کوڕی سەمورە دەڵێت بیستم لە پێغەمبەرﷺ کە دەیفەرموو: {لَا يَزَالُ أَمْرُ النَاسِ مَاضِيًا مَا وَلِيَهُمْ اثْنَا عَشَرَ رَجُلًا ثُم تَكَلَمَ النبِي صَلى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ بِكَلِمَةٍ خَفِيَتْ عَلَي فَسَأَلْتُ أَبِي مَاذَا قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقَالَ كُلُهُمْ مِنْ قُرَيْشٍ / البخارى ومسلم واللفظ له / کارو باری ئەم خەڵکە بە باشی دەڕوات هەتا سەرپەرشتی ئەوان دەکەن دوانزە پیاو لە پاشان قسەیەکی فەرمو بە هێواشی تێ نەگەیشتم‌و پرسیارم لە باوکم کرد کە پێغەمبەرﷺ چی فەرمو؟ وتی: فەرموی هەمویان لە قورەیش دەبن}

ئیبنو کەسیر لەو بارەوە دەڵێ: مانای ئەم فەرودەیە موژدەیە بە بونی دوانزە خەڵیفەی صالح کە بەراستی رەفتار دەکەن‌و دادپەروەرانە دەبن لە ناویانداو پێویست ناکات ئەم دوانزە کەسە یەك بە دوای یەکدا بێت بەڵکو چواریان بە دوای یەکدا هاتون کە (ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلیە)و لەوانەیە عومەری کوری عبدالعزیزو بێگومان هەندێ لە بەنی عەباسیش‌و هەرگیز قیامەت نایەت هەتا ئەم دوانزە کەسە بە تەواوی فەرمانڕەوایی نەکەن‌و ئەوەش کە ڕونە ئەو مەهدیەی کە لە فەرمودەکانی پێغەمبەر دا باسکراوە لەوانە، ئەمە ئەو مەهدیە چاوەڕێ کراوەی رافیزیەکان نیە لە سەردابی سامەڕا، ئەوە هیچ بناغەیەکی راستی نیەو هیچ شتێکی وایش نیە ، بەڵکو ئەوە بۆ چونی هەندێ عەقڵی بێ قیمەتەو خەیاڵاتی چەند دڵێکی نەخۆشەو مەبەست لەم دوانزە خەلیفە ئەو دوانزە خەلیفەی ئەوان نییە وەك بیری لێ دەکەنەوەو باسی دەکەن. تەواو بو بە کەمێ دەستکاریەوە. ئینجا ﷲ درێژە بە باس کردنی رەوشتە بێ نرخەکانی جولەکە دەداو دەفەرموێ:

(١٣) جا بە هۆی ئەوەی کەئەوان پەیمانە بە هێزەکەی خۆیانیان شکاند ئێمەیش نەفرینمان لێ کردن‌و ئێمە دڵەکانی ئەوانمان رەش کردو هەستی هیچ خەیرو خۆشیەکیان نەدەکرد کە ئەمانە دەستیان کردوە بە گۆڕینی ئایەتەکانی خوا هەم لە وشەکانی داو هەم لە خوێندنەوەی دا تەنانەت لەم دواییانەدا هەندێ لە گاورەکانی ئەوروپا دانیان ناوە بەم گۆڕانەداو خۆئەگەر ئەوانیش دانی پێدا نەنێن ئێمە دڵنیاین کە قسەی خوا راستەو ئەوان تەورات‌و ئینجیلیان گۆڕیوەوە لە بیریان چویەوە بەشێك لەوەی کە ئامۆژگاریان پێ کرا بو ئێستاش بێ پسانەوە تۆ دەبینیت‌و دەزانیت کە ئەوان هەر خەریکی ئیشی ناپەسەندو خیانەت کارین سەبارەت بە خۆت‌و یارەکانت ئەی محمدﷺ مەگەر کۆمەڵێکی کەمیان نەبێت وەکوعەبدوڵای کوڕی سەلام کەوابو تۆ لێیان ببورەو پشتیان تێبکە، بێگومان کە ﷲ چاکە کارانی خۆش دەوێت. ئەمە بەر لە دەرچونی بڕیاری جیهادە ، واتە: ئەم ئایەتە حوکمەکەی هەڵوەشاوەتەوە بە ئایەتەکانی جیهاد، ئینجا پاش جولەکە خوا باسی گاورەکان دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٤) خۆ لەو کەسانەش کە دەیان وت ئێمە گاورین پەیمانمان لێ وەرگرتن جائەوانیش هەروەکو جوەکان بەشێکیان لەو ئامۆژگاریانەی کە پێیان وترابو لە بیر چویەوە، ئینجا بە هۆی ئەوەوە ئیتر ئێمەش ڕق‌و قینمان لە ناویاندا هەڵگیرساند کە وامان لێ کردن هەمیشە شەڕو رقەبەری هەبێت لە ناویاندا ئەوەتە دەبینین کە گاور نەك هەر خۆیان چەند مەکتەبی دژی یەکن ، بەڵکو خاوەنی چەند ئینجیلی گۆڕاون هەرچەند لە پێشەوە یەك ئینجیل بوە، ئینجا خوا هەڕەشەیان لێ دەکات‌و دەفەرموێ: وە بەم زوانە کە لە رۆژی قیامەتدایە ﷲ خەبەریان دەداتێ بەوەی کە دەیانکردو تۆڵەیان لێ دەسێنێ‌و توانای هیچ پەلە قاژەیەکیان نامێنێت. وە ئەمە هەڕەشەیشە لە ئێمە، چونکە ئەمڕۆ ئێمەش وەکو ئەوان زۆرێك لەو شتانەی کە ئامۆژگاریمان پێ کراوە لە

وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١٤﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴿١٥﴾ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٦﴾ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾

بیری خۆمان بردوەتەوەو پارچە پارچە بووین‌و دوچاری هەمان بەدبەختی وسەرشۆڕی ئەوان بووین‌و لەدژی یەکتر ئیش دەکەین؟! ناوو شۆرەت‌و کورسی‌و پارە بۆ ئەم ئوممەتە وەك ژاری مارە وشیرینێکی پڕ لەژارە.

(١٥) ئەی ئەهلی کتێب بە راستی هاتە لاتان پێغەمبەری ئێمە کە محمدﷺ ـە کە ئاشکرای دەکات بۆتان زۆر لەو شتانەی کە ئێوە دەیشارنەوە لەو کتێبەی خۆتاندا وەك ئایەتی رەجم کە دەیان ویست بلێن: لە تەوراتدا نیەو چاو پۆشیشی کردوە لە زۆر شتیش، چونکە نایەوێت زیاترئابڕوتان ببات بەڵکو دەیەوێت رێنمایتان بکات بە راستی هاتە لاتان لە لایەنی خواوە روناکیەکی گەورە کە محمدﷺ ـەکە ﷲ پێغەمبەری بە نورو روناکی داناوە هەروەکو روناکی تاریکی لادەبات‌ورێگای راست رۆشن دەکاتەوە وپەڕاوێکیش کە راست‌و ناراست لەیەك جیا دەکاتەوە کە قورئانە.

(١٦) خوا بەو کتێبە یان بەو پێغەمبەرەﷺ رێنمایی دەکات ئەو کەسەی کە پەیرەوی ئەو شتانە بکات کە دەبن بە هۆی رەزامەندی خواو دەریان دەهێنێت لە تاریکیەکانەوە بۆ روناکی و خوا رێنماییان دەکات بۆ گرتنی رێگای راست کەرێگای پێغەمبەران‌و راستگۆیان‌و چاکان‌و شەهیدانە دیسان خوای زاناو دانا یەکێکی تر لە رەوشتە ناپەسەندەکانی گاورەکانمان بۆ باس دەکات‌ودەفەرموێ:

(١٧) دڵنیابن ئەو کەسانەی کە وتیان: بە راستی خوا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە ئەوانە کافر بوون، دەی بڵێ کێ خاوەنی شتێکە لە لایەنی خواوە ئەگەر خوا بیەوێت مەسیح‌و دایکی مەسیحیش‌و هەرچی وا لەم سەر زەوییەدا بیکوژێت؟ کێ هەیە دەستی خوا بگرێت؟ دەی ئەگەر مەسیح خوایە بۆ دەستی خوا ناگرێت با لە بەین نەچێت‌و با نەهێڵێت دایکی بمرێت؟ ژییر بن. وە ئەوەی لە ئاسمانان‌و زەویدا یە هەموی موڵکی خوایە ، عیسایش یەکێکە لەوان‌و موڵکی خوایەو دروست دەکات ئەوەی کە ئارەزۆی لێ بێت‌و کەس ناتوانێت دەست بخاتە کاروباریەوە، چونکە خوا دەسەلاتی بە سەر هەمو شتێکدا هەیە بەڵێ دروستبونی عیسا (علی نبینا وعلیه السلام) شتێکی زۆر گرنگ‌و سەرسوڕهێنەرەو دەڵێن: ئەگەر خوا نیە ئەی چۆن بێ باوك دروستبوە راستە شتێکی زۆر گرنگە، بەڵام ئەی ئێوە نازانن کە خۆی لە دایکێك دروستبوە کەوابو هەر موحتاجە بە دایك ، بە بێ دایك هەر نەبوە خۆ شتێ لەوە گەورەتر هەیە کە ئادەمەو ﷲ دروستی کرد بە بێ دایك‌و باوك، بەم شێوەیە خوا دەمکوتی ئەوانە دەکات کە عیسا بە خوا دەزانن کە بەشێکن لە گاور بە ناوی یەعقوبییەوە ناو دەبرێن، هەروەها زیاتر خوا پێناسەی ئەهلی کتێبمان بۆ دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٨) جولەکەو گاور دەڵێن: ئێمە کوڕی خواین‌و دوستانی ئەوین. جا ئەمە ئەوە نەبێ هەردووکیان بە یەکەوە ئەوەیان وتبێت بەڵکو ئەوانیش یەکتر بە راست نازانن‌و هەر کامیان هەر خۆی بە راست دەزانێ‌و هەرخۆی بە کوڕی خواو دۆستی خوا دەزانێت. ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر راست دەکەن ئەوان کوڕی خودان‌و دۆستی ئەون دەی خودا بۆچی سزاتان دەدات بە بۆنەی گوناهەکانتانەوە؟ بەڵکو ئێوەش بەشەرێکن لەوانەی کە ﷲدروستی کردون کەچاوپۆشی دەکات لەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت‌و سزا دەدات ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت، واتە: هیچ کەسێك خزمایەتی‌ودۆستایەتی لە تەك خوادا نیەو بە گوێرەی چاکی‌و خراپی خۆی پاداش یان سزا وەردەگرێت و ئەوەی لە ئاسمانان‌و زەوی دایەو ئەوەش کە لە نێوانیان دایە بە گیاندارو بێ گیانەوە هەموی موڵکی ﷲ یەو لە دواییدا هەمو هەر لەلای ئەوجێگای دەبێت. جێگای وردبوونەوەیە کە داستانی موساو بەنی ئیسرائیل لە داستانی هەمو پێغەمبەرانی تر زیاتر باس کراوە لە قورئان دا لە بەر چەندین هۆی گرنگ کە ئەمە هەندێکیان:

یەکەم ـ تا موسڵمانان ئەم چینە ناپاکە چاك بناسن‌و خۆیان لە شەڕیان بپارێزن.

**دووهەم** ـ تا موسڵمانان بترسنو ئەوانیش ئا بە شێوەی ئەوان لە گەڵ ئەم پێغەمبەرەی ئاخر زەمان ﷺدا رەفتار نەکەن تا دوچاری نەفرینو سزای خوا نەبن.

**سێهەم** ـ مانای وایە کە ئەم گەلە ناپاکە بە درێژایی تەمەنی ئەم ئایینە ئەمێنێتەوە.

**چوارەم** ـ تا ستەمکاران بترسنو ئەو بە سەر هاتەی فیرعەون بکەن بە دەرسو هەرچی زوتر دەست لە تاوانو ستەمکاریو دژایەتی ئەم ئاینە بکێشنەوە هەر چەند تاوانو ستەم بکەن هەر بەو هێزە دەگەن کە فیرعەون پێی گەیشت.

**پێنجەم** ـ تا بانگ کەرانی رێگای خوا بێ باکانە درێژە بە بانگەوازی خۆیان بدەنو بزانن هەرچی خوا نەیکات کەس ناتوانێ بیکات خۆفیرعەون بۆ لە ناو بردنی موسا کاتێ لە سکی دایکیا بو هەوڵی دەدا، بەڵام خوا ناردیە ماڵی فیرعەونو هەر بە فیرعەونو ماڵی فیرعەون موسای گەورە کرد.

**شەشەم** ـ تا بانگ کەرانی ئایین خۆیان رابێنن لە سەر تەنگو چەڵەمەو برسیتیو بزانن کە ئایندە هەربۆ خواو پەیرەوانیەتیو ئەمانو سەرشۆڕی بۆ دوژمنانی خواو ئاینەکەیەتی کە ئەمانەو دەیان سودی تر لەو داستانانەوە بە زەقی دەردەکەوێتو خوا یار بێ لە هەر جێگایەکدا شتێکی لێ باس دەکەین.

جارێکی تر ﷲ رو دەکاتەوە ئەهلی کتێبو نیعمەتی رەوانە کردنی پێغەمبەرانیان دەخاتەوە بەر چاوو دەفەرموێ:

(١٩) ئەی ئەهلی کتێب پاش ئەوەی کە ماوەیەکە پێغەمبەر نەهاتوە بەراستی وا پێغەمبەری ئێمە کە محمدە ﷺ هاتوەتە لاتانو هەرچی پێویست بێت بۆتان رون دەکاتەوە تا نەڵێن: نەهاتوتە لامان موژدە دەرو ترسێنەر، دەی وا هاتە لاتان موژدە دەرو ترسێنەر موژدە دەدات بەو کەسانە کە ئیشی چاك دەکەن بە بەهەشتو رەزامەندی خواو بە سەرکەتنی دنیاو قیامەت، هەروەها دەیان ترسێنێت لە پاشە رۆژی ئیشی خراپو سەر شۆڕیو سزای قیامەت تا بەڵکو ژیرانە بیر بکەنەوەو لەو ئیشە خراپانە واز بهێنن تا خوا لێیان خۆش بێت. بەراستی ﷲ توانای هەیە بەسەر هەموو شتێکدا. ئینجا دەفەرموێ:

(٢٠) باسکە ئەی محمد ﷺ ئەوکاتەی کە موسا بە گەلەکەی خۆی وت: ئەی گەلی من بیر بکەنەوە لەو نیعمەتە گەورەی کە خوا داویەتی پێتان کە لە خۆتان چەندین پێغەمبەری ناردوە ، وە ئێوەی کردوە بە پاشاو شتانێکی داوە بە ئێوە کە نەی داوە بە خەڵکی تری ئەو سەردەمە لەوانە گەزوەو شیلاقەو سێبەری هەورو دەیان شتی تری سەر سوڕ هێنەر. بەڵێ هەر پێغەمبەرێك لە دنیا دەرچوو بێت ﷲ پێغەمبەرێکی تری ناردوە بۆیان کە

وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٨﴾ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٩﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمۡ يُؤۡتِ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمٗا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمَا ٱدۡخُلُواْ عَلَيۡهِمُ ٱلۡبَابَ فَإِذَا دَخَلۡتُمُوهُ فَإِنَّكُمۡ غَٰلِبُونَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٢٣﴾

دواتریان عیسا بوو، وشەی **(ملوك)** بەو کەسە دەڵێن کە ماڵو خزمەتکاری ببێت.

(٢١) ئەی گەلی من بچنە ئەو زەویە پیرۆزەی کە خوا دایناوە بۆتان کە قودسەو پاشگەز نەبنەوە لەم دینەو لەم بیروباوەڕە بە راستی زیانکار دەبنو دەبن بە گەلێکی رەنجەڕۆ. بەڵێ موسا ئا بەم شێوەیە ئامۆژگاری ئەوانی کرد بەڵام ئەوان :

(٢٢) وتیان: ئەی موسا لەوێ گەلێکی خاوەن دەسەڵاتو خاوەن هێز هەیەو ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو جێگایە هەتا خۆیان دەرنەچن لەو جێگادا جا ئەگەر ئەوان دەرچوون لەو جێگادا ئەو کاتە ئێمە دەچینە ناویەوە.. ئاشکرایە لە ناو هەموو گەلێکدا چاكو خراپ هەیەو دەبێو بووە بەڵام ئەگەر خراپەکان زۆر بون وەکو جولەکە ئەوە ئیتر رۆژ رەشیو بەدبەختیە لێرەش دوو نەفەری چاکیان هەبو وەکو خوا دەفەرموێ:

(٢٣) دوو پیاو لە ناو ئەواندا کە لە خوا دەترسانو خواش نیعمەتی خۆی رژاند بو بە سەریانداو پەیڕەوی راستەقینەی موسابون دەستیان کرد بە ئامۆژگاری گەلەکەیانو ترساندنیان لە پاشە رۆژی ئەم سەر پێچیو ناڵە باریەی کە دەربارەی موسا کردیانو وتیان: بچنو لەدەرگای شارەکانیانەوە بڕۆنەناوەوە جا ئەگەر ئێوە چونە ناو شارەکەوە ئیتر بزانن کە ئێوە سەر کەوتو دەبنو تەنها پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئێوە باوەڕدارنو

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَآ أَبَدٗا مَّا دَامُواْ فِيهَا فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾

لەدەسەڵاتو هێزی ئەوان مەترسن. ئەم دوو پیاوە لە خوا ترسە ئا بەو شێوەیە ئامۆژگاری ئەو گەلەیان کرد بەڵام بە گشتی :

﴿٢٤﴾ وتیان: ئەی موسا هەرگیز تا ئەوان لەو شارەدابن ئێمە ناچینە ناوییەوەو شەڕ ناکەین جا تۆو خواکەت بڕۆن شەڕ بکەن، ئێمەش ئا لێرەدا تەماشاچی لێی دادەنیشین، بەڵێ ئەو گەلە هەر پێیان خۆش بو کە تەماشا چی بن نەك پیاوی مەیدان، بەڵام ئەمڕۆ کە موسڵمانان پارچەپارچەن‌وراست نین لە تەك یەکتردا ئەوانن پیاوی شەڕوداگیر کردن ، جا تەماشا کەن ئەو قسە ناشیرینەی ئەوانو وەڵامی یارە پیرۆزەکانی پێغەمبەرﷺ کە لە بەدرا وتیان: ئەگەر فەرمان بدەیت بە چونە ناو دەریاوە هەر تۆ چویت ئێمە هیچ کامان دوا ناکەوین‌و دەپەڕینە ناویەوە، وەکو گەلی موسا نالێین :﴿ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴾ بەڵکو دەڵێین: تۆو خوای خۆت شەڕ بکەن ئێمەش لە گەڵتانین بە راستی پێغەمبەریش ﷺچاك یارەکانی خۆی ناسیوەو شایستەی ئەوە بون کە پێغەمبەری خواﷺ ئەم دوعایەی بۆ کردن‌و فەرموی: خوایە ئەگەر ئەم کۆمەڵە لە بەین بچێت ئیتر لەم زەویەدا کەس ناتپەرەستێت بەڵێ پێغەمبەرمان ﷺ ئاوەهای دەگوت بە یارەکانی خۆی ، بەڵام موسا چی بەوان وت؟.

﴿٢٥﴾ وتی: خوایە ئیتر من بێجگە لە خۆم‌و براکەم دەسەڵاتی کەسی ترم نیە، واتە: کەس بە گوێم ناکات دەی خوایە ئێمەو ئەم گەلە فاسقە لەیەك جیا بکەرەوەو حیسابی ئێمەو ئەوان بە یەکەوە مەکە. ئیتر ئەوە بو خوا نزاکەی لێ وەرگرت‌و ئەوان کەوتنە ئەو سەرگەردانیەوە بەڵام موساو هارونی برای زۆر بە دڵێکی ئارامەوە باسی ئایین‌و خوا پەرەستیان دەکرد ، وا دەردەکەوێت ئەم جیا بونەیە بەو مانایە نەك ئەمان بە لەش جیا ببنەوە لە گەلەکەیان ـ هەر خوایش زانایە ، خوای زاناو دانا لە وەڵامی موسادا دەفەرموێ :

﴿٢٦﴾ مادام ئەوان ئاواسەرپێچی فەرمانی موسایان کردو نەچونە شارەکەوە، سا ئیتر نابێ ئەوان بچنە ناو ئەو شارەوەو چل ساڵ بە سەرگەردانیو هەوانتەدەگەڕێن بە سەر زەویدا. بەڵێ اللهخاوەنی هێزەو ئەگەر بیەوێت سەر لە کەسێك بشێوێنێت ئاوەهای لێ دەکات؟! کەواتە ئەی موسا تۆ نارەحەت مەبە لە سەر ئەو سەرگەردانیو سەر لێشێوانەی ئەو گەلە سنور بەزێنە، چونکە خۆیان سەر لە خۆیان دەشێوێنن‌و حەز بە رابواردن دەکەن نە جیهادو خەبات، گەنجیش بێ رەنج نەبوەو نابێت ، پاش ئەوەی کە ئەم داستانەی بۆ باسکردین، ئینجا الله داستانێکی ترمان بۆ باس دەکات نەك زۆر زۆر لە پێش زەمانی موسادا بوە بەڵکو لەسەرەتاکانی دروستبونی مرۆڤدایە کە باسی حەسادەتی نێوان دوو کوڕی ئادەمەو دەفەرموێ:

﴿٢٧﴾ ئەی محمدﷺ بخوێنەرەوە بۆ ئەوان دەنگو باسی دوو کوڕەکەی ئادەم کە هەردووکیان قوربانیان کرد ، قوربانی یەکێکیان وەرگیراو قوربانی ئەوی تریان وەرنەگیرا، ئینجا رق‌و ئیرەیی سەری هەڵداو قوربانی لێ وەرنەگیراو سوێندی خواردو وتی: دەتکوژم بۆ قوربانی تۆ وەرگیراو هی من وەرنەگیرا؟ ئەویش وتی: خوا لە موتەقیان وەردەگرێت لەوە دەچێ کە تۆ پارێزکار نەبیت بۆیە الله لێی وەر نەگرتویت ، ئیتر گوناهی من لەوەدا چیە کە قوربانی من وەرگیراوەو هی تۆ وەرنەگیراوە؟

﴿٢٨﴾ بە راستی ئەگەر تۆ دەست درێژی بکەیتە سەرم‌و بمکوژی من دەست دریژی ناکەمە سەر تۆ بۆئەوەی کە بت کوژم چونکە بێگومان من لە خوا دەترسم کە پەروەردگاری عالەمە.

﴿٢٩﴾ بێگومان من دەمەوێت کە تۆ بە گوناهی کوشتنی من‌و بە گوناهی خۆتەوە ببیت بە رەفیقی ئاگری جەهەنەم‌و ئا ئەوەیە سزای ستەمکاران. جا ئەوە مومکینە هەر قسەی ستەم لێکراوەکە بێت کە بە ستەمکارەکە وتبێت یان فەرمودەی خوا بێت ، خوا دەفەرموێ: سزای ستەمکاران ئاوەهایەو هەر کەسێك ئاوای کرد دەچێتە ناو ئاگری جەهەنەمەوە، لێرەدا دەفەرموێ: بە گوناهی من‌و بە گوناهی خۆتەوە هەندێك وتویانە هەر کەسێك کەسێك

بکوژێت ئەو کابرایە چەند گوناهی هەبێت ئەکەوێتە سەر شانی بکوژ، بەڵام مانای پێشو راسترە چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿ هیچ نەفسێکی تاوانبار تاوانی نەفسێکی تر هەڵناگرێت﴾ دەڵێن: یەکەم کەسێك لەم ئۆمەتەدا کەمانای ئەم ئایەتەی ئەنجام دابێت (عوسمانی کوری عەفان ) بوە کاتێ کە هاتنە سەری. هەروەها پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {إِذَا تَوَاجَهَ الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا فَكِلَاهُمَا مِنْ أَهْلِ النَّارِ قِيلَ فَهَذَا الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ قَالَ إِنَّهُ أَرَادَ قَتْلَ صَاحِبِهِ /متفق علیه/ هەر کاتێ دوو موسڵمان روبەڕوی یەکتر بونەوە بە شمشێرەکانیان (چەکەکانیان)و یەکێکیان یەکێکیانی کوشت هەر دوو لە ناو ئاگردان ، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ بکوژ حەقی خۆیەتی ئەی کوژراو بۆچی؟ فەرموی: بە راستی ئەویش ویستویەتی رەفیقەکەی خۆی بکوژێت} ئاوا بەو شێوەیە هابیل خۆی دایە دەستی قابیل، بەڵام قابیل شەیتان وای لە خشتە برد بوو هیچ بەزەیی بەم برای خۆیدا نەهاتەوەو لەو ئارەزۆ پیسە دەستی نەکێشایەوە تا سەرئەنجام دەستی خستە خوێنی براکەی وەك خوای گەورەو دانا دەفەرموێ:

(٣٠) ئینجا نەفسی کوشتنی براکەی بۆ چاك کرد. دەڵێن: نەی دەزانی چۆنی بکوژێ، چونکە تا ئێستا کوشتن و نەمانی نەدەزانیو شەیتان هاتو نەفەرێکی هێنا سەری نایە سەر بەردێكو بە بەردێکی تر لە سەری دا هەتا سەری پان کردەوە، ئینجا شەیتان بە پەلە ئەم هەواڵەی دا بە حەوای دایکیو وتی: قابیل هابیلی کوشتوەو حەوایش وتی: ئەوە چی دەڵێیت؟ کوشتن چیە؟ وتی: ئەوەیە نە نان دەخواتو نە ئاوو نە دەجوڵێت ، وتی: مردنە؟ وتی: بەڵێ مردنە ، ئیتر دایکە حەوایش هاواری کردو ئادەم هاتە لایو ئەو هەر هاواری دەکرد وتی: ئەو چیتە؟ هیچ وەڵامی نەدایەوە دوو جار هاتە لای هەر هیچ وەڵامی ئادەمی نەدایەوەو هەر هاواری دەکرد، ئیتر ئادەمیش وتی: ئەم هاوارو قیڕەو قاڵە هەر لە سەر خۆتو کچەکانت بێتو منو کوڕەکانی لێ دوور بێت (تەبەریو ئیبنوکەسیر لەئیبنوئەبی حاتەمەوە). وتراوە کە ئەودوو کوڕەی ئادەم ناویان: (قابیلو هابیل) بوە .

جا بەو شێوەیە قابیلیان هابیلی برای خۆی کوشتوەو یەکەم کەس بو کە کوشتنی داهێناو بو بە هاوبەشی هەمو خوێنێکی ناڕەوا هەتا ئینسان لە سەر زەویدایە وەك پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی: {لَا تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلَّا كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الْأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا لِأَنَّهُ كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ /البخاری ومسلم وغ ا / هیچ کەسێك بە بێ تاوان ناکوژرێت، مەگەر بەشێك لە تاوانی کوشتنەکەی بدرێت بە سەر ئەول کوڕی ئادەم (قابیل)دا،چونکە ئەو یەکەم کەس بو کە کوشتنی داهێنا} کەوابوو قابیل بەو ئیشە خراپەی توشی ئەو بەدبەختیە گەورەیە بو جا لە بەر ئەوە بۆ هەمیشە چوە ریزی خەسارەت مەندانەوە. جا هەروەکو یەکەم کوشتن بوە وادەردەکەوێت کەیەکەم شاردنەوەی مرۆڤیش بوە بۆیە نەی زانیوە چۆنی بشارێتەوە جا چەندی پێچوە راستیەکەی هەر خوا خۆی دەزانێت، هەروا لەو ناوەدا دایان نا تا خوا ماموستایەکی بۆ ناردن ـ دەڵێن دوو قەلە رەشە لە بەر چاوی ئەواندا بە شەڕ هاتنو یەکێکیان یەکێکیانی کوشت وەك دەفەرموێ:

(٣١) جا الله قەلە رەشەیەکی نارد کە زەوی هەڵکەنێ ، جا هەر زەوی هەڵکەند بێت یان وەکو وتمان رەفیقی خۆی کوشتبێو شاردبێتیەوە، بە هەر حاڵ تا پێشانی بدات کە چۆن تەرمی براکەی بشارێتەوە ، جا کە ئەوەی دیت وتی: هاوار بۆ من ئایا من لەو قەلە رەشە بێدەسەڵات ترم کە تەرمی براکەی خۆم بشارمەوە؟ ئینجا پاش شاردنەوەی پەشیمان بویەوە. ئیتر نازانین کە ئەو پەشیمان بونەوەیە تەوبە بوە یان نە ئەوە بو پێغەمبەرمانﷺ فەرموی: هەتا رۆژی قیامەت هەر کەسێك بە ناحەق بکوژرێت بەشێکی بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، چونکە یەکەم کەسە کە کوشتنی داهێناوە ئەمەش مانای کافر بون ناگەیەنێت کەسێکیش کافر نەبێت هەر رزگاری دەبێت لە جەهەنەم ئەگەر چی ماوەیەکی ئێجگار زۆریش لە جەهەنەمدا بمێنێتەوە ، وە لە فەرمودەیەکی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ: { مَا مِنْ ذَنْبٍ أَجْدَرُ أَنْ يُعَجِّلَ اللهُ لِصَاحِبِهِ الْعُقُوبَةَ فِي الدُّنْيَا مَعَ مَا يَدَّخِرُ لَهُ فِي الْآخِرَةِ مِنْ الْبَغْيِ وَقَطِيعَةِ الرَّحِمِ/رواه الترمذی وغ ە وصححە الألبا / هیچ تاوانێك شایستە تر نیە کە خوا بە پەلە لە دنیا دا تۆڵەی لێ وەربگرێ لە گەل ئەو سزا گەورەیەش کە دایناوە بۆی لە پاشەرۆژدا لە ستەمو لە بچڕانی پەیوەندی خزمایەتی} کە لە راستیدا لەم روداوەی قابیلدا هەردوویان هەیە، جا بەم شێوەیە خوا جوەکان دەترسێنێت لە نیەتە پیسەکەیان سەبارەت بە پێغەمبەرمان ﷺو دەفەرموێ :

(٣٢) هەر لە بەر خاتری ئەو کوشتنە ناڕەواو خود سەرانە تا جارێکی تر ئەو جۆرە تاوانانە نەکرێت وا ئێستا ئێمە یاسایەکی توندو تیژ دادەنێین لە سەر جوەکان کە بەم شێوەیە: بە بێگومان بریارئەوەیە کە هەر کەسێك کەسێك بە ناڕەوا بکوژێت نە کەسی کوشت بێت وە نە خراپەی لە زەوی دا بڵاوکردبێتەوە هەر کەسێك نەفسێك بەو شێوەیە بکوژێت وەکو ئەوە وایە کە هەمو خەڵکی کوشت بێت، چونکە دڵەڕاوکەو نائارامی بۆ هەمو کەس پەیدا دەبێتو مرۆڤ هەمو گیانیان دەکەوێتە مەترسیەوەو ئاسودەیی لە ناو خەڵکدا هەڵدەگیرێتو هەر کەسێك کەسێك لە مەرگ رزگار بکات وەك ئەوە وایە کە هەمو خەڵکی ژیاندبێتەوە

مِنْ أَجْلِ ذَٰلِكَ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِى ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ۚ وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِٱلْبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ﴿٣٢﴾ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُا۟ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓا۟ أَوْ يُصَلَّبُوٓا۟ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْىٌ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱبْتَغُوٓا۟ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُوا۟ فِى سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُوا۟ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾

چونكە مادام داكۆكی كرا بۆ رزگار كردنی گیانی كەسێك هەمو كەس دڵخۆشەو وا هەست دەكات كە ئەویش هەر وا پارێزراو دەبێتو هێوریو ئاسایش باڵ دەكێشێ بە سەر ژیانی هەمو خەڵكدا، وەك لە سورەتی بەقەرەئایەتی/سەدوحەفتاونۆدا دەفەرمویێ:﴿ خۆ لە تۆڵە سەندنەوەدا ژیان هەیە بۆتان ﴾ ئینجا دەفەرموێ: بە راستی هاتوەتە لاتان پێغەمبەری ئێمە بە نیشانە گەلێ ئاشكراو روون، بەڵام زۆربەی ئەوان لە پاش ئەو هەموو راستیە كە دەیزانن زیادەرەوەن لەم سەرزەوییەداو سنورەكان دەبەزێننو فەسادو خراپە بلاو دەكەنەوە، ئینجا دەفەرموێ:

﴿٣٣﴾ ئەو كەسانەی كە دژایەتیو شەڕ لە گەل خواو پێغەمبەری خوادا دەكەنو دەیانەوێت لەم زەوییە دا خراپیو ناپاكیو كوفر بلاو بكەنەوە تۆڵەو سزایان هەر ئەمانەیە كە بكوژرێن یان هەڵ بواسرێن یان دەستو لاقیان ببڕێت كە چەپو راست بقرتێنرێت یان دوور بخرێنەوە لە ناوزەی داو لە شوێنی خۆیاندا نەیان هێڵنەوە ، ئەمە سەر شورپەكە بۆ ئەوان لە ژیانی دنیاداو لە رۆژی قیامەتیش دا سزایەی زۆر گەورەیان بۆ هەیە، واتە: شەڕ دەكەن دژی خەڵك ئەگینا كەس ناتوانێت شەڕ لە گەل خواداو لە پاش وەفاتی پێغەمبەریش ﷺ تازە شەڕ لە گەڵ ئەویشدا بكات ئەی بۆ راستەوخۆ نەوتراوە هەر كەس دژی خەڵك بێت بە نارەوا ئەوە تۆڵەكەیەتی؟

**یەكەم**: تا شتەكە زۆر بە تاوانێكی گەورە بزانرێتو دور بكەونەوە لێی.

**دووهەم**: تا دەركەوێت كە ئایین هاتوە بۆ پاراستنی شەرەفو كەرامەتو گیانو ماڵی خەڵك ئەوەتە هەر شتێك بۆ گشتی بێت خوا بە هی خۆی دادەنێت.

**سێهەم**: تا هەڵی بنێت كە بڵێ شەڕ لەگەڵ خوای گشتتاندایە. جا هەمووتان شەڕ بكەن هەر وەكوو چۆن ئەگەر ئیشێكی باش كراو سودی هەبو بۆ خەڵك بە ﴿فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ واتە لەرێگای خوادا دادەنرێت، بەڵێ زانایان ناكۆكیان بوە لەسەر ئەوە ئایا كەسێك خراپەی بلاو كردەوە لەم چوار حوكمە كامەیان ئەنجام بدرێت ئایا بەدەست حاكمە كە كامیان ئەنجام بدات یان تەماشای ئیشی ئەو خراپەكارانە دەكرێت؟ هەندێك دەڵێن: حاكم بەكەیفی خۆیەتی كامیان لەو حوكمانە ئەنجام بدات دروستە. عەبدوڵای كوڕی عەباس دەڵێ: ئەوەی لە قورئاندا هاتوە بەوشەی (**او**) ئەنجامدەری ئەوحوكمە سەر پشكە لە ئەنجامدانی هەر كام بەسودی دەزانێ، وە هەندێكی ترلە زانا پێشوەكان ( **السلف**) وتویانە: لەم ئایەتەدا دەبێ بە پشت سەری یەك بێت، واتە: ئەو كەسەی كە خەڵكی كوشتو ماڵی برد دەبێ بكوژرێتو هەڵواسرێت وە ئەوەی كە تەنها ماڵی دەبرد دەبێت دستو رانی ببڕێتو ئەوەی تەنها خەڵكی دەترساند نە ماڵی دەبردو نە كەسی دەكوشت دەبێ دوور بخرێتەوە، هەندێ تر لەزانایان بەندیخانە بە دوور كەوتنەوە دادەنێت، لەبارەی هەڵواسینەوە زۆربەی زانایانی فیقهی دەڵێن: دەبێ بە زیندویی رۆژێ یان سێ رۆژ لە سەر رێگای گشتی هەڵواسرێت بۆ ئەوەی ببێت بەپەندێك بۆباقی خراپەكاران بەڵكو بگەرێنەوە لە تاوانكردن تا دوچاری ئەو جۆرە سزایە نەبن ، لە پاشا دەكوژرێت كە ئەمە مەزهەبی مالیكیو حەنەفیەكانە، وە هەندێكی تر دەڵێن: نابێ بە زیندویی هەڵبواسرێت تا بەم شێوەیە رێگای نوێژ كردنو خواردنو خواردنەوەی لێ نەگیرێت بەڵكو دەبێ بكوژرێت، ئینجا هەڵواسرێت ئەمەش مەزهەبی شافیعیە رەزای خوا لە هەمویان. (**روائع البيان مد على صابو** ) لەمبارەوە تەماشا بكە.

هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە دەڵێن: كۆمەڵێ خەڵكی تیرەی (عورەینە) هاتنە مەدینەو موسڵمانان بوون، بەڵام ئاوو هەوای مەدینە لە گەلیان نەگونجاو تووشی نەخۆشی بوون، پێغەمبەری خوا ﷺ ناردنی بۆ لای حوشترەكانی زەكاتو فەرموی: شیرو میزەكانیان بخۆن ئەوانیش ئەم ئیشەیان كردو چاك بونەوەو پاشگەز بونەوە لە ئیسلامو شوانی حوشترەكانیان كوشتو حوشترەكانیان برد پێغەمبەریش ﷺ كە هەواڵی زانی كۆمەڵێ لە یارەكانی نارد بە دوایانداو گرتنیانو هێنایاننەوە بۆ مەدینەو

پێغەمبەرﷺ فەرموی: دەستو قاچیان ببڕنو چاویان دەربهێننو فڕەیان دەنە ناو بەردەڵانەکانی مەدینە تا مردنو بە دوای ئەوە دا ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ .....الاية ﴾ بەڵێ تاوانبارو پاشگەز بووەوە دەبێ ئاوا تۆڵەیان لێ وەربگیرێت لە دنیاداو لە رۆژی دوایشدا سزایەکی زۆر بە ئێشو ئازار یان بۆ هەیە ، ئەم قورئانە چاو بەس لە کەس ناکاتو نایەوێ بە فێڵ خەڵك بخاتە ناوچاڵەوە بەڵکو پێشەکی ئاوا رێگای راستو ناڕاست رۆشن دەکاتەوەو پاداشو سزای هەردووکیان دیاری دەکاتو هەڵیان دەنێت بۆ چاکە کردنودەیان ترسێنێ لە پاشە رۆژو ئاکامی خراپی، وتراوە: (السعيد من اتعظ بغ ه/ سەرکەوتو ئەو کەسەیە کە لە پاشە رۆژو ئاکامی ئیشی بێجگە لە خۆی پەندو ئامۆژگاری بگرێت) جا ئایا ئەو کەسانەی کە دەستیان دایە خراپە کاری پەشیمان بونەوەیان لێ وەردەگیرێت یان نە؟ خوا دەفەرموێ: دژایەتی کەری خواو پێغەمبەر بیان کوژنو هەڵیانواسنو دەستو قاچیان ببڕن :

(٣٤) مەگەر تەوبە بکەن پێش ئەوەی کە ئێوە زاڵبن بە سەریانداو بکەونە دەستتان، ئەوە ئیتر لەو تاوانانەی پێشوو چاو پۆشیان لێ دەکرێت لە دنیاداو پاشە رۆژیش خوای میهرەبان دەیان بەخشێت وەك لە کۆتایی ئەم ئایەتە دا دەفەرموێ: دەی چاك بزانن بێگومان کەخوا خوایەکی لێبوردەو میهرەبانەو لە تاوانەکانیان خۆش دەبێتو بە میهرەبانی خۆیشی دەیان خاتە بەهەشتەوە، دەی بە راستی زۆر زۆر شایانە کە ئێمەی نەوەی ئادەم رووبکەینە ئەو خوایەو سوپاسی بکەینو لە تۆڵەو سزای ئەو زاتە خاوەن دەسەڵاتە خۆمان بپارێزینو رێگای خۆشبەختی بگرینە بەر کە رێگای ئیسلامە وەك لێرەشدا بانگمان دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٥) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسنو بە رەو گەیشەتن بە رەزاو رەحمەتی خوا هۆ پەیدا بکەن ، چونکە باوەڕی رووتی بێ کردار هیچ سودێکی نیەو پێویستە بە کرداری چاك ئەو باوەڕە بە هێز بکرێت تامرۆڤ بە میهرەبانی خوای خۆی بگات نەك دانیشێو هەر بڵێ خوا بەرەحمە ، ئەو کردارە چاکانە هۆن بۆ خۆ نزیك کردنەوە لەخوا، ئەمە بەو مانایە نیە کە دەبێت کابرا شێخێك بکات بە هۆکارێك بۆ لای خوا، ئەگەر وابێ دەبێ بڵێین: بەندایەتی تایبەتی هەندێکەو بەس، چونکە باقی خەڵکی تر با بچنو ئەوان بکەن بە هۆ بۆ خۆیانو دوکانداریەکەی گەورەکانیش هەروایەو شتێکی کەمتر لەمە نیە، وە کۆشش بکەن لە رێگای خوادا بەڵکو رزگار ببن. بەڵام پێویستە ئەوەش بزانین کە رێنماییو رێبەرایەتی کردنی خەڵك بەرەو خوا پەرەستی

يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٣٧﴾ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٠﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٤١﴾

ئیشێکی زۆر گەورەو بە نرخەو کابرا بە هەر ناوێکەوە بیکات جێگای رێزە چ بە ناوی مەلاوە یان بە ناوی شێخەوە چونکە ناو گرنگ نیە ناوەڕۆك گرنگە. (وسیلة) ئەو شتەیە کە ئینسان بە هۆی ئەوەوە ئەگات بە مەبەست ، هەروەها (ناوی) بەرزترین شوێنی بەهەشتەو جێگای پێغەمبەرمانەﷺو نزیکترین جێگایە لە عەرشی خواوە، لەم بارەوە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {مَنْ قَالَ حِـ ـ يَسْمَعُ النِّدَاءَ اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ وَالصَّلَاةِ الْقَائِمَةِ آتِ مُحَمَّدًا الْوَسِيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ / البخاری / هەر کەسێك وەختێ گوێی لە بانگ بوو وتی: ئەی خوای ئەم بانگە تەواوەو ئەم نوێژە ئەنجام دراوە بە محمدﷺ وسیلەی ببەخشەو ریزی گەورەی بۆ دابنێو زیندوی بکەرەوە بۆ ئەو جێگا سوپاسکراوەی کە بەڵێنت پێ داوە ، جا ئەوکەسە با دڵنیا بێت کە شەفاعەت کردنی منی بۆ حەڵاڵ دەبێ لە رۆژی قیامەتدا} ئینجا دەفەرموێ: :

(٣٦) بێگومان ئەوانەی کە بێ باوەڕن ئەگەر ئەوەی لە سەر زەویدایە هەموی موڵکی ئەوان بێتو ئەوەندەی تریشی لە گەڵ دابێتو بیانەوێت بە فیدیەی بدەن لە باتی سزای قیامەتدا لێیان وەرناگیرێتو بۆ ئەوان سزایەکی دەردناك هەیە:

(٣٧) دەیانەوێت دەرچن لە ئاگر لەحاڵێکدا کەئەوان دەرچونیان نییە لە ناویداو بۆ ئەوان سزایەکی هەمیشەیی هەیەو هەرگیز

نابڕێتەوە. ئەمەش بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە بێ باوەڕان هەرگیز ڕزگار نابن لە جەهەنەم. ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {يُؤْتَى بِالرجُلِ مِنْ أَهْلِ النار فيُقالُ يَا اِبْنَ آدَمَ كَيْفَ وَجَدْتَ مَضْجَعَك؟ فيَقُولُ: شَرَ مَضْجَعٍ ، فيُقال لَهُ: هَلْ تَفْتَدِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ ذَهَبًا؟ فيَقُولُ نَعَمْ يَا رَب ، فيُقال لَهُ كَذَبْتَ قَدْ سَأَلْتُك أَقَل مِنْ ذَلِكَ فَلَمْ تَفْعَلْ فيُؤْمَرُ بِهِ إِلَى النار /متفق عليه/: پیاوی وا دەهێنرێت لە جەهەنەمیەکان و خوا پێی دەفەرموێ: ئەی کوڕی ئادەم جێگاکەت چۆنە؟ ئەویش دەڵێت: خراپترین جێگایە! دەفەرموێ: ئەی ئایا پڕی زەوی ئاڵتونت ببێ دەیدەیت بۆ ئەوەی لەو جێگایە ڕزگارت ببێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: کابرا یەژێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم !خوا دەفەرموێ: درۆ دەکەیت چونکە من کەمتر لەوەم داوا کردوە لە تۆ لە دنیاداو تۆ نەت کردوە، ئینجا فەرمانی پێ دەکرێت کە ببرێتەوە بۆ ناو ئاگر} ئینجا ﷲ یاسایەکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٨) ئەو کەسەی کە دزی دەکات پیاو بێت یان ژن دەستیان ببڕن ئەمە سزایەکە بە هۆی ئەو کردەوە ناپەسندەی کە کردویانە، کە ئەمە تۆڵە سەندنەوەیەکە لە لایەن خواوە بۆ ئەوانو ﷲخاوەن دەسەڵاتەو ئیشەکانیشی بە حیکمەتە. دیارە پێغەمبەری خواﷺ شێوەی ئەو دەست بڕینەی دیاری کردوە کە ئەگەر کەسێك یەکەم جار بو دەستی ڕاستی دەبڕێت ئەگەر دووبارەی کردەوە لاقی چەپی دەبڕێت، جاری سێهەم دەستی چەپیو جاری چوارەم لاقی ڕاستی لە جومگەدا دەبڕن بەو مەرجەی قیمەتی شتە دزراوەکە لە چوار یەکی دینار کەمتر نەبێتو بەشی خۆی لەو ماڵە دا نەبێتو ئەو ماڵەش لە جێگای دانانی جۆری خۆیدا بێت، واتە: ئەگەر کابرا پارەی لە حەوشەدا دانابو دزرا دەستی ئەو دزە نابڕێت،چونکە کابرای خاوەن ماڵ کۆتایی کردوە لە هەڵگرتنی ماڵەکەیدا، لێرەدا پیاوی پێش ئافرەت ناو هێناوەو لە سورەتی نوردا لە بارەی زیناوە ئافرەتی پێشی پیاو ناوی هێناوە ، چونکە لە ئیشی زینادا ئافرەت زیاتر دەبێت بە هۆی زینا ئەگەر ئافرەت خۆی نەدات بەدەستەوە پیاو هیچی پێ ناکرێت، وە ئەگەر خۆی بەرەڵا نەکات پیاو توانای تەماشا کردنیشی نیە، بەڵام لە دزی کردندا هێزو لێهاتویی دەوێتو ئافرەت کەم دەتوانێت دزی بکات بۆیەلەم بارەوە پیاو زیاتر دەتوانێ دزی بکات لە بەر ئەوە پیاوی پێش خستوە والله اعلم، ئەسمەعی دەڵێ ئەم ئایەتەی دزیم خوێندەوەو لە تەنشتمدا پیاوێکی عەرەب دانیشتبو وتم: ﴿والله غفور رحيم﴾ کابرای عەرەب وتی: ئەوە قسەی کێیە؟ وتم: هی خوایە وتی: دووبارەی بکەرەوە منیش هەر وتم: ﴿والله غفور رحيم﴾ کابرا وتی: ئەوە قسەی خوا نیە منیش بیرم کردەوەو وتم: ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ﴾ وتی: پێکات، ئەوە قسەی خوایە، وتم : تۆ قورئان دەزانی؟ وتی: نەخێر، وتم: ئەی چۆنت زانی کە من بە هەڵە داچووم؟ وتی: ئەی کابرا (عَزَ فَحَكَمَ فَقُطِعَ ولو غَفَرَ وَرَحِمَ لَمَا قُطِعَ/ خاوەن دەسەلاتەو بڕیاری داوەو جا بڕا ، خۆ ئەگەر لێ بوردە بوایە وبەزەیی پێدا بهاتایەوە نەدەبڕا) هەرچەندە ئەمە بەڵگەی زیرەکی کابرای عەرەب بووە بەلاَم لە ڕاستیدا بەڵگەی تەواو بە یەکەوە لکانیو ڕێكو پێکی ئەوەڵو ئاخری ئایەتەکانی قورئانە ، جا با بزانین ئەو کەسانەی کە دزی دەکەن ئایا بۆیان هەیە تەوبە بکەن یان نە؟ ﷲ دەفەرموێ:

(٣٩) جا هەر کەسێك تەوبە بکات دوای ئەو ستەمەی کە کردویەتی لە خۆیو لە خەڵكو ئیشی باشی کرد ، ئەوسا بێگومان کە خوا تەوبەی لێ وەردەگرێت، بێگومان کە خوا زۆر زۆر لێبوردەو بە سۆزە. ئەمەش بەڵگەیە لە سەر سۆزو ڕەحمی خوا بەرامبەر بەبەندەکانی هەندێك نەزان وەك نەزانو نەفامەکانی ئەمڕۆ ڕەخنەیان لەم یاسایە گرتوەو وتویانە خوێنی ئینسان بریتیە لە (١٠٠) سەد حوشتروو ئەگەر کابرا دەستێك بڕێت ئەبێ (٥٠) پەنجا حوشتر جەریمە بکرێت ئەی بۆ دەبێت لە سەر ڕوبعە دینارێك ئەو دەستە ببڕرێت؟ بە ڕاستی ئەوانە تەنیا ڕواڵەت بینەنو ڕاستیوسودی بڕیارەکە نازانن ، قازی عەبدولوەهاب مالیکی لە وەلاَمی ئەو نەزانانەدا دەڵێت: (لَمّا كَانَتْ أَمِينَةً كَانَتْ ثَمِينَةً فلما خَانَتْ هَانَتْ/ واتە: ئەو دەستە کاتێ کە ئەمین بو بە قیمەت بو جاچونکەخیانەت کار دەرچو بێ قیمەت بو) بە ڕاستی ئیشێکی زۆر تەواو زۆر پەسندە کە ئەو نرخە گەورەیە دابنرێت لە سەر کەسێك کەدەست درێژی بکاتە سەر ئەو دەستە پاكو بێ تاوانەو لە ناوی ببات، وەئەو دەستە سوکەیش کە ماڵو ژیانی خەڵکی تێك دەداتو ئاسودەییو هێمنی لە ناو دڵەکانوماڵەکاندا دەفڕێنی جێگای خۆیەتی کەئاوا بێ نرخ بێو لە سەر شتێکی کەم لە ناو ببرێت.

تێبینی : -

یەکەم - ئەو سیفەتانەی خوا کە لە پاش ئایەتەکانەوە هاتوە وەکو ﴿غفور رحيم ، يع عليم ، عزيز حكيم ، على كل شىء قدير ، خب ا تعملون﴾ هەمویان وەکو مۆرێك وایەو مانای ئایەتەکە دوویات دەکاتەوەو هەر زانایەکی بە هۆش قورئانی لا بخوێنرێتەوە پێش کۆتای هاتنی ئایەتەکە خەیاڵی دەچێت بۆ کۆتاییەکەی وەك لە پێشەوە داستانی ئەسمەعیت بیست هەرچەند کابرای عەرەب خوێندەوار نەبو، بەلاَم زەینێکی چاکی هەبو، ئەوە ئایەتی دەست بڕین بو ﴿عزيز حكيم﴾ی فەرمو لە پاشدا ئایەتی تەوبە بو ﴿غفور رحيم﴾ی فەرمو، جا ئیتر باش

گوێ بگرە بۆ کۆتای هەمو ئایەتەکان تا ئەو راستیەت جوان بۆ رون ببێتەوە.

**دووهەم** - دروست نیە کاتێ کە تاوانبار چووە لای حاکمو تاوانەکەی حەدی دیاری هەبو تکای بۆ بکرێت - راستەو بۆ ئاشتەوای کەریش پاداش هەیە وەك لە سورەتی (**النساء** \٨٥) دا فەرموی - چونکە لە فەرمودەی (صحیح) دا هاتوە کە ئافرەتێکی مەخزومی دزی کرد بو بەلاَم تیرەکەی زۆر بەلایانەوە عەیب بو کە دەستی ئەو ئافرەتەیان لە سەر دزی ببڕێت لە بەر ئەوە زۆر هەوڵیان دا کە کەسێك بدۆزنەوە تکای بۆ بکاتو پێغەمبەرﷺ دەستی نەبڕێتو بێجگە لە ئوسامەی کوری زەید کە زۆر خۆشەویستی پێغەمبەر بو کەسیان دەست نەکەوت، ئافرەتیان هێناو داوایان لە ئوسامە کرد کە تکای بۆ بکات ئوسامەیش تکای بۆ کرد پێغەمبەرﷺ سور هەڵگەڕاو نارەحەت بو فەرموی: {**أَتشْفَعُ فِي حَد مِنْ حُدُود الله**؟!/ ئایا لە بارەی حەدێك لە حەدەدکانی خوا وە تکا دەکەیت؟!}، ئوسامە کوتو پڕ وتی: داوای لێخۆشبونت لێ دەکەم ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەم روداوە بە درێژی لە بوخاریو موسلم دا هاتوە. ئینجا ﷲباسی خۆی دەکاتو دەفەرموێ::

(٤٠) ئایا تۆ نازانیت ئەی ئەو کەسەی کە قورئان قسەت لە گەڵدا دەکات بێگومان هەر موڵکی خوایە ئەوەی لە ئاسمانانو زەویدایە کەسزا ئەدات ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێتوکەس ناتوانێت رێگای لێ بگرێتو خۆش دەبێت لەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت، خۆ ﷲ دەسەڵاتی بە سەر هەمو شتێکدا هەیەو دەتوانێ تۆڵەی لێ وەرگرێت یان پاداشتی بداتەوە، واتە: هەموی موڵکی خوایەو خاوەن موڵك هەر جۆرە ئاڵوگۆڕیەك لە موڵکی خۆیدا بکات مافی خۆیتیو کەس بۆی نیە دەست بخاتە کاروباریەوەو مرۆڤیش بەشێکی زۆر بچوکە لەوموڵکەی خوا بەلاَم دەبێ ئەوە بزانین کە خوا ستەم لە کەس ناکات، ئینجا خوا رودەکاتە پێغەمبەرﷺو دەفەرموێ:

(٤١) ئەی پێغەمبەرﷺ با تۆ خەمبار نەکات ئەو کەسانەی کە بەپەلەن لە تاوانو کفردا لەو کەسانەی کە بە دەم دەڵێن: باوەڕمان هێناوە بەلاَم دڵیان باوەڕی نەهێناوە ، وەلەو جوولەکانەی کەگوێ دەگرن بۆ درۆو گوێ دەگرن لە گەلێکی تر کە نەهاتونەتە لای تۆ کە وشەکانیش دەگۆڕنو لە شوێنەکانی خۆیاندا لایان دەبەن، ئینجا دەڵێن بڕۆن ئەگەر وەك قسەی ئێمەتان لە گەڵدا کرا ئەوە وەریگرن، وە ئەگەر ئەوەتان پێ نەوترا ئەوسا وریا بنو دوور کەونەوە لێی ئا بەم شێوەیە خەڵکیان دەخەڵەتاندو لەپێغەمبەریان دوور دەخستنەوە ، ئینجا

سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٣﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾

ﷲ دەفەرموێ: هەر کەسێك کە خوا بیەوێت سزای بداتو تۆڵەی لێ وەرگرێتو بیخاتە ناو کارەساتو نارەحەتیەوە ئەی محمدﷺ تۆ خاوەنی هیچ شتێك نیت بۆیو تۆ ناتوانیت هیچی بۆ بکەیت، ئا ئەوانە کەسانێکن کە ﷲ نایەوێت کە دڵەکانیان پاك بکاتەوە ، کە بۆ ئەوانە هەیە سەرشۆڕی لە دنیاداو لە قیامەتیش دا سزایەکی گەورەیان بۆ هەیە، ئێستا کە جوو سێ ملیون کەس زیاترن ئەوە ماوەی زیاتر لە چل ساڵە لەشەڕدان ، جا ئەگەر دەستیان بە دەستی ئەمریکاوە نەبوایە دەمێك بو ناویان لە کورەی زەویدا سڕابویەوە جا ئەگەر چی خۆیان بە حکومەتو خاوەن هێز دەزانن، بەلاَم لە راستیدا هەر سەر شۆڕن. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٤٢) گوێ گربون بۆدرۆو حەرام خۆربون وەك سوو خۆریو بەرتیل وەرگرتنو دزی کردن، دەی ئەگەر ئەوان هاتن بۆ لای تۆ بۆ شیکردنەوەو لابردنی گیرو گرفتیان ئەوە تۆ لە نێوانیاندا دادپەروەرانە بڕیار بدە وەکو چۆن حوکم دەکەیت بۆ خاوەن باوەڕان یان پشتیان تێ بکەو گوێیان مەدەرێو بڵێ: بڕۆن خۆتان گیرو گرفتی خۆتان چارەسەر بکەن، جا ئەگەر پشتت تێ کردن مەترسە لەوان ئەوان ناتوانن هیچ زیانێکت لێ بدەن، وە ئەگەر حوکمیشت کرد بە دادپەروەرانە حوکم بکە لە نێوانیاندا با کافریش بنو دژایەتی دینەکەی تۆ بکەن مادام هاتن بۆ لای تۆ بۆ حوکم تۆ دەبێ بە دادپەروەرانە حوکم بکەیت بە بێگومان کەﷲ دادپەروەرانی خۆش دەوێتو حاکمی دادپەروەر لە رۆژی قیامەتدا

له ژێر سێبەری عەرشی خوادایە. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إنّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ اللهِ على مَنابِرَ مِنْ نورٍ، الّذينَ يَعْدِلونَ فِي حُكْمِهِم وأَهْلِيهِم وما وَلُوا/ رواه مسلم / داد پەروەران لەلای خوا لەسەر مینبەرەکانی نورن، ئەوانەی کە دادگەر بون لە حوکمەکانیانو لەناو خێزانیانو لەگەڵ ئەوانەی کە کراون بە سەرپەرشتیان.

(٤٣) چۆن ئەوان تۆدەکەن بەبڕیاردەر بۆ خۆیان لەحاڵێکدا کەئەوان تەوراتیان لایە کە بڕیاری اللّٰه ی تێدایە،واتە: ئەگەر ئەوان ڕاست دەکەن بۆ تەماشای تەورات ناکەنو بۆ ڕاستیەکانی ئەشارنەوە لە پاشان دوای ئەوەی کە تۆ بڕیارت بۆ دان پشت دەکەنە ئایینو پشت دەکەنە بڕیارەکەت؟! خۆ ئەوانە باوەڕدار نین. {دەڵێن: جولەکەکان پیاوو ژنێکیان هێنایە لای پێغەمبەرﷺ کە زینایان کرد بو، پێغەمبەرﷺ فەرموی خوێندەوارترینتانم بۆ بهێنن ، ئەوانیش دوو کوڕەکەی "سوریا" یان هێناو سوێندی دان چۆنە ئیشی زینا لە تەورات دا؟ ئەوانیش وتیان: لە تەورات دا ئەگەر چوار کەس شایەتیان دا کە چاویان پێ کەوتوە کە ئالەتی پیاوەکە لە ناو لەشی ئافرەتەکەدایە وەکو میلی ناو کلدان ئەبێ سەنگسار بکرێن. فەرموی: دەی بۆ سەنگساریان ناکەن؟ وتیان: دەسەڵاتمان نەماوەو کوشتنمان پێ خۆش نیە، پێغەمبەری خوا بانگی شایەتەکانی کردو هاتنو شایەتیان دا کە بە چاوی خۆیان ئالەتی ئەو پیاوەیان لە ناو لەشی ئەو ئافرەتەدا دیوە وەکو میل لە ناو کلدان دا ، پێغەمبەرﷺ فەرمانی داو سەنگسار کران} (رواه مسلموابو داود وابن ماجه) ئاوەها دەرکەوت کە ئەو جولەکانە باوەڕیان بە تەوراتەکەی خۆیشیان نەبو، تەنها دەیان ویست خۆیان ڕزگار بکەن لە فەرمانی خوا ، بۆیە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ جا خوا بەوانە دەفەرموێ: باوەڕدار نین. ئەی ئێمە باوەڕدارین سەدان فەرمانی قورئانمان خستوەتە پشت گوێ؟ ئەی خۆ بە موسڵمان زان بیربکەرەوە. ئینجا خوا وەسفی تەورات دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٤) بێگومان کەئێمە تەوراتمان ڕەوانە کرد کە لەودا ڕێنماییو ڕۆشن کردنەوەی ڕاستو ناڕاست هەبو کە بەو حوکمیان دەکرد ئەو پێغەمبەرانەی کە هەمیشە گەردن کەچی فەرمانی خودا بون بە سەر جوەکاندا ، هەروەها خوا پەرستو زاناکانیان بەو تەوراتە حوکمیان دەکردو بڕیاریان دەداو بەندایەتیان دەکرد، چونکە ئەوان کرا بون بە چاودێرو نیگابانی ئەو کتێبەی خوا کە تەوراتەو ئەوان شایەت بون لە سەر ڕاستیو درستی ئەو پەڕاوە ، ئەوسا لە خەڵکی مەترسنو هەر لە خۆم بترسنو هەرگیز نیشانەکانی ئێمە نەفرۆشن بەنرخێکی کەمو ئەو کەسەی کە حوکم نەکات بەوەی کە خوا ڕەوانەی کردوە ، سا بزانن کە هەر ئا ئەوانەن خوا نەناسن.

(ربانی) بە بەندایەتی کەران دەوترێتو (احبار) کۆی (حبر) ە واتە:زانا. ئەمە بەو مانا نیە کە ئەگەر بە نرخێکی زۆر بێ گۆڕنیەوە دروستە ، نەخێر بە هیچ نرخێك نابێ حەقو ڕاستی بشارێتەوە چونکەئەگەر هەمو دنیاش بدرێت بە کەسێك لە سەر ئەو شاردنەوەیە هەر ڕەنجەڕۆو شەرمەندەیە، چونکە هەمو دنیا لای خوا بە ئەندازەی پەڕی مێشولەیەك نرخی نیە، وەکو پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ/رواه الترمذى وصحح الألبا / هەمو دنیا ئەگەر بە ئەندازەی پەڕی مێشولەیەك نرخی هەبوایە لەلای اللّٰه نەی دەهێشت کافر یەك قوم ئاوی تێدا بخواتەوە} کەواتە ئەگەر عالمێکی دینی حەقێکی شاردەوەو نەی وت لە بەر خاتری ئەوەی کە هەمو دنیای پێ بدەن کە هەرگیز شتی واش نابێ کە دنیا بدرێت بە یەك کەس ئەوە ئەو زاناو عالمە زیانی کردوەو بەهرەیەکی زۆر کەمی وەرگرتوە لە سەر دین فرۆشیەکەی بەداخەوە لەم زەمانەدا شتێکی وایشیان پێنادرێت، بەڵام هەر زۆر بە هەرزانی دینەکەی خۆمان دەفرۆشین؟! هەروەها خوای داناو ئاگا درێژە بە وەسفی تەورات دەداتو دەفەرموێ:

(٤٥) لە تەورات دا پێویستمان کرد لە سەر ئەوان کە بێگومان تۆڵەی گیان بە گیانە ، واتە: ئەگەر کەسێك بکوژرێت بە ناڕەوا دەبێ بکوژ بکوژرێتەوە مەگەر خاوەنەکەی چاوپۆشی لێ بکات پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {الْمُسْلِمُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ/ ا د، النسائى، صحه الألبا / واتە موسڵمانان وەکو یەکە خوێنەکانیان} واتە: جیاوازیان نیە، وە ئەم ئایەتە بەم فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ کە دەفەرموێ: {وَلَا يُقْتَلُ مُسْلِمٌ بِكَافِرٍ/البخارى/ موسڵمان ناکوژرێت بە کافر}. تایبەت دەبێت بە باوەڕدارانەوە. ئینجا دەفەرموێ: چاو لە جیاتی چاودا دەر دێتو لوت لە جیاتی لوت داو و گوێ لە جیاتی گوێ دا دەبڕێت ، واتە ئەگەر کەسێك چاوی کەسێکی دەرهێنا یان لوتی بڕی یان گوێی بڕی یان کەڕی کرد هەر بەو شێوەی لە گەڵدا دەکرێتەوە، وە بۆ برینەکان تۆڵە هەیە، واتە: هەر برینێك دەبێ بە گوێرەی خۆی لە برین کەر برین بکرێت ئەگەر دەگونجا ، وە ئەگەر نە دەگونجا دەبێ خوێنی بدات ئەمانە دەبێ بەو شێوەیە ئەنجام بدرێن مەگەر خاوەن ماف کابرا ببەخشێت وەك دەفەرموێ: جا ئەگەر خاوەن ماف مافی خۆی بەخشی ئەوە ئیتر کابرای ئیشکەر ڕزگاری دەبێتو بەخشەندەش پاداشی بەخشینی خۆی بەچەند قاتەوە دەست دەکەوێتەوە ، پیغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {مَا مِنْ رَجُلٍ يُجْرَحُ فِي

جَسَدِهِ جِرَاحَةً فَيَتَصَدَّقُ بِهَا إِلا كَفَّرَ اللهُ عَنْهُ مِثْلَ مَا تَصَدَّقَ بِهِ /رواه أ د/ هیچ پیاوێك نیە كە برینێك بكرێ لە لەشیو چاو پۆشی لەو مافە بكاتو كابرا ببەخشێت مەگەر خوا داپۆشێت بۆی تاوانەكانی بە هۆی ئەو بەخشینەوە بە ئەندازەی نرخی ئەو چاكەیە} ئا ئەمانە بەشێكن لە یاساكانی خواو دەفەرموێ: ئەوەی كە حوكم نەكات بەوەی كە خوا رەوانەی كردوە ئائەوانە ستەمكارانن، هەروەها فاسقانن وەكو لە دوایدا دێت زالمو فاسقو كافر بە یەك مانا دێت كەكفرو خوانەناسییە ، بەڵام مەرج نیە هەرچی زاڵم بێت كافریش بێت وە هەرچی فاسقبێ كافر بێت، بەڵام هەمو كافرێك فاسقو زاڵمە، بۆ؟ چونكە كابرای كافر زوڵمی كردوە لە خۆیو لە خەڵك، چونكە گاڵتە بە ژیری باوەڕداران دەكاتو خۆیشی دوچاری سزای سەختی دوا رۆژو ئاگری جەهەنەم دەكاتو هەروەها فاسقیشە، چونكە كابرای كافر دەرچوە لە سنوری خوا بەڵام شەرت نیە كابرا هەر دەرچو لە سنوری خوا كافر ببێت، چونكە هەر تاوانێك بكرێت دەرچون لە سنورە، بەڵام ئینسان بە هەمو تاوانێك كافر نابێت. ﷻ پاش ئەوەی كە وەسفی تەوراتی كرد وا ئێستا وەسفی ئینجیل دەكات كە بۆ عیسا ﷺهاتوەو دەفەرموێ:

(٤٦) بە دوای ئەو پێغەمبەرانەدا عیسای كوڕی مەریەممان هێنا كە دانی دەنا بەوەی كە لە پێش خۆیدا بوە كە تەوراتەو ئینجیلیشمان دا بەو كەلەودا رێنماییو چاو رۆشنی هەبو، وە دانی دەنا بە راستی ئەوەی كە لە پێش خۆی دا هاتبوكە تەوراتەو رێنماییو ئامۆژگاری بو بۆ لە خوا ترسانی سەردەمی خۆی، دیارە ئەوانە كە لە پێش قورئان دا هاتوون چ تەوراتو چ ئینجیل و چ بێجگە لەوانیش هەڵوەشاونەتەوەو كاریان پێ ناكرێ چونكە هەر بۆ سەردەمێكی تایبەت بوونو تێكیش دراونو كەس نازانێت كامیان راستەوكامیان ناراستە، ئینجا خوای داناو ئاگاو میهرەبان دەفەرموێ:

(٤٧) با ئەهلی ئینجیل حوكم بكات بەوەی كە خوا لە ئینجیل دا رەوانەی كردوەو ئەو كەسەی كە حوكم نەكات بەوەی كە خوا رەوانەی كردوە ئەوانە فاسقن. بەرائی كوڕی عازیب ﷺ دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ یەهودیەكی بینا كە داخ كرابوو تازیانەیشی لێدرا بو ، جا پێغەمبەرﷺ بانگی جولەكەكانی كردو فەرموێ: {هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزانِي فِي كِتَابِكُمْ / ئا ئاوایە تۆڵەی زیناكار لە كتێبەكەی خۆتاندا؟ وتیان: بەڵێ، جا پێغەمبەرﷺ یەكێك لەزانایانی خۆیانی بانگ كردو فەرموێ: أَنْشُدُكَ بِاللهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزانِي فِي كِتَابِكُمْ / سوێندت دەدەم بەو خودایەی كە تەوراتی ناردوە بۆ موسا ﷺ ئایا ئاوەهایە حەدی زینا لە كتێبەكەتاندا؟ جا وتی: نەخێر، ئەگەر بەمە سوێندت نەدامایە ئەمەم پێ نەدەوتی، بەڵام لەبەر ئەوەی كە لەناوی پیاو ماقوڵانماندا ئەمە زۆر بو، جا هەر كاتێك پیاو ماقوڵانمان بیكردایە وازمان لیٚ دەهێنانو ئەگەر لاوازەكانمان بیكردایە حەدمان بەسەریاندا جێبەجێ دەكرد ، جا بۆیە وتمان با لە سەر حوكمێك كۆبېینەوە كە لە سەر ماقوڵو لاواز بە بێ جیاوازی جێبەجێی بكەین جا لەجێگای رەجم دا، داخكردنو تازیانەمان دانا ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: { اللَّهُمَّ إِنِي أَوَلُ مَنْ أَحْيَا أَمْرَكَ إِذْ أَمَاتُوهُ فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ/ مسلم وغ ه/ ئەی خودایە من یەكەم كەسێكم كە ئەو بڕیارەی تۆ كە مراندویانە، زیندوی دەكەمەوە،جا فەرمانی دا بەوبڕیارە ئەوسا كابرا رەجم كرا} ئینجا ﷻ ئەو ئایەتانەی رەوانە كرد كە باس لەو كەسانە دەكات كە بە فەرمانی ﷻ حوكم ناكەن كە بە زاڵمو فاسقو كافر ناویان دەباتو دەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴾ المائدة: ٤٤. بەڵام مەبەست ئەوە نیە كە ئەمە هەر بۆ گاورو جولەكەوایە، لە حوزەیفە ﷺ پرسیاریان كرد كە ئەم ئایەتانە مەبەست پێی ئەهلی كتێبە؟ فەرموی: { نِعْمَ الإِخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرائِيلَ، إِنْ كَانَتْ لَكُمْ كُلُ حُلْوَةٍ وَلَهُمْ كُل مُرِةٍ، وَلَتَسْلُكُنَّ طَرِيقَهُم قَدْرَ الشِرَاكِ./نفس الط ي/ بەراستی بەنی ئیسرائیل برایەكی چاكن بۆ ئێوە هەرچی شیرینە بۆ خۆتانو هەرچی تاڵە بۆ ئەوانە لەحاڵێكدا ئێوە وەك قەیتانی پێڵاو رێگای ئەوان

وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾

دەگرنەبەر} جا دەرکەوت مەبەست لە کوفر لەم ئایەتەدا کوفری گەورەیە واتە ئەو کوفرەیە کە مرۆڤ لە بازنەی ئیمان دەردەکات هەروا کە ئیبنوعەبباس دەڵێت:{ هَؤُلَاءِ الْآيَاتُ الثَلَاثُ نَزَلَتْ فِي الْيَهُودِ خَاصةً فِي قُرَيْظَةَ وَالنضِيرِ / أبو داود، الألبا : حسن صحيح الإسناد/ واتە: ئەم سێ ئایەتە لەبارەی یەهودەوە هاتوەتە خوارەوە بەتایبەت قورەیزەو نەزیر. دیارە کە کوفری یەهود کوفری گەورەیە (**كفر الأكبر**).

جا ﷲ لەم ئایەتەدا بەراشکاوی فتوای کافر بوونی ئەو فرمانڕەوایانە دەدات کە بە یاساو شەرعی ﷲ حوکم ناکەنو یاسایەکی تر لە سەر خەڵك پێویست دەکەن. تەتارەکان کاتێك کە وڵاتی ئیسلامیان داگیرکرد لە سەر خەڵك ئەو یاسایەیان پێویست کرد کە شاکەیان چەنگیزخان بۆی دانابون کە ئەو یاسایە لە چەندین ئایین وەك ئیسلامو یەهودیو مەسیحی وەرگیرا بو، جا ئبنو کەسیر لە تەفسیرەکەیدا باسی لێدەکاتو دەڵێت: ( **فَصَارَتْ بَنِيهِ شَرعاً مُتَبعاً يُقَدمُونَهَا عَلَى الْحُكمِ بِكِتَابِ ا ـِ وَسُنةِ رَسُولِ ا ـِ ﷺ، فَمَن فَعَل ذَلِكَ مِنهُم فَهُوَ كَافِرٌ يَجبُ قِتَالُهُ حَتى يَرجِعَ إِلَى حُكمِ ا ـِ وَرَسُولِهِ ﷺ، فَلا يَحكُم سِوَاهُ قَلِيلٍ وَلا كَثِ** ٍ/ جا ئەو یاسایە لەناو نەوەکانیدا بوبە یاسایەك کە پەیڕەوی لێدەکراو بەسەر حوکمو بڕیاری ﷲ و پێغەمبەرەکەی ﷺ دا پێشیان دەخست، جا هەر کەس وابکات ئەوە کافرەو پێویستە شەڕی لەگەڵدا بکرێت تا دەگەڕێتەوە بۆ حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی ، وە نابێت بێجگە لەو بە هیچی تر حوکم بکات نە لە کەمو نە لە زۆردا. بەڵام پێویستە ئەو بزانرێت کە ئەگەر هاتو حاکمێکی موسڵمان کە بە یاساو شەریعەتی ئیسلام حوکمی دەکردو یاسای ئیسلامی بە باشترین یاسا دەزانی ، ئەگەر لە مەسەلەیەکدا بە هۆی شتانێك وەك بەرتیل یان رشوە یان تورەیی یان خزمایەتی، لەو روداوەدا بە پێی شەرعی ﷲ حوکمی نەکرد بەڵام لە هەمان کاتدا باوەڕی بەتاوانباری خۆی لەو مەسەلەدا هەبو، وە ئەو حوکمەیشی وەك یاسایەك لە سەر خەڵك پێویست نەکردو حوکمی شەرعی لەو مەسەلەدا نەگۆڕی ئەوە تەنها تاوانبارەو لە بازنەی ئیمان دەرنەچوە بەڵکو توشی کوفری بچوك یان "كفر دون كفر" بوە. وەك ئیبنو عەباس لە وەڵامی ئەوانەی کە ئەم ئایەتەیان دەکرد بە بەڵگەو حاکمانی سەردەمی خۆیان بە هۆی هەندێ بڕیاری ناشەرعی کە لەو حاکمانە دەردەچوو، بەکافردەزانی فەرموی: (كفرٌ دون كفرٍ.. لَيسَ بِالْكُفرِ الذي تَذهَبونَ إليهِ/ ئەوە کوفری بچوکە... ئەو کوفرە نییە کە ئێوە باسی لێدەکەن) جا پێم بڵێن: ئەمڕۆ کام وڵاتە یان کام فەرماندەیە کە بە فەرمانی خوا حوکم دەکاتو باوەڕی پێی هەیەو هیچ بڕیارێکیش لەو بە چاکتر نازانێت ئەگەر هەیە ئێمەش لەگەڵتاین کە ئەگەر لایدا لە یاسایەك لەبەر یەکێك لەو هۆیانە کەوتمان ئەوسا دەڵێین: دوچاری کوفری دون کفر بووە؟! ئینجا دەفەرموێ:

(٤٨) خۆ ڕەوانەمان کردوەتە لای تۆ ئەی محمدﷺ ئەم قورئانە بە ڕاستی نەك بە گاڵتەو گەمە ئەویش دان دەنێت بەڕاستیودروستی ئەوانەی کە لە پێش خۆیدا بوونو چاودێرو خاوەن هێزو نیگەهبانە لەسەر ئەوانەی کە لە پێش خۆیدا هاتوون کەوا بو تۆ حوکم بکە لە نێوانیانا بەو شێوەی کە خوا رەوانەی کردوەو هاتوە بۆ تۆو دوای ئارەزۆکانی ئەوان نەکەویت بەلادان لەو حەقو راستییەی کەهاتوتە لات. ئینجا دەفەرموێ: بۆ هەمو ئۆمەتەکانی پێش تۆش یاساو رێبازێکمان داناوە کە لە سەری بڕۆن ، خۆ ئەگەر خوا مەیلی بوایە هەموتانی دەکرد بە یەك ئایین، بەڵام خوا بڕیاری نەداوە کە ئاوەها بێتو بە گوێرەی زەمان هەندێك حوکمی گۆڕیوە هەتا دواترین پێغەمبەرو دواترین پەیام کە قورئانە ئیتر حوکم بەوانە دەکرێت هەتا قیامەتو ناگۆڕێ، ئینجا خوا بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی کە بۆچی هەموی یەك ئایین نەبوە دەفەرموێ: تاکو خوا تاقیان بکاتەوە و دەرکەوێت کە کێ حوکم دەکات بەوەی کە پێمان داونو کێ حوکمی پێ ناکات ، جا مادام تاقیکردنەوەیە دەی پەلە بکەن بۆ کردنی ئیشە چاکەکان کە هەر بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە جا ئیتر هەواڵتان پێ دەداتو تێتان دەگەیەنێت کە کێ راستەو کێ ناراستە لە ناکۆکیەکاندا، واتە: لە خوا بترسنو رێگای راست بگرن هەرچی بکەن دەبێ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، خوایش راستو ناراست لە یەك جیا دەکاتەوە نە لە کەس دەترسێو نە لە کەس شەرم دەکاتو هەر کەس بە ئەندازەی گەردیلەیەك چاکە یان خراپەی هەبێت پیشان دەدرێت. دووبارە ﷲ ئامۆژگاری پێغەمبەرمان ﷺ دەکاتو هەڵی دەنێتو دەیترسێنێت لە فرتو فێڵی بێ باوەڕانو دەفەرموێ:

(٤٩) ئەی محمدﷺ تۆ حوکم بکە لە نێوان ئەوان دا بەوەی کە خوا ڕەوانەی کردوەو پەیڕەوی ئارەزۆی ئەوان نەکەویتو خۆ بگرە لە سەر قسەو بڕیاری خۆتو ئاگات لە خۆت بێتو وریا بە نەوەك لات بدەن لە هەندێك لەوەی کە خوا ڕەوانەی کردوە بۆت ، جا ئەگەر ئەوان پشتیان هەڵچەرخاندو گوێیان نەدایە خۆتو بەرنامەکەت دەی تۆ بزانە کە ﷲ دەیەوێت دوچاریان بکات بە تۆڵەی هەندێك لە گوناهەکانیانەوە ، بێگومان کە زۆربەی خەڵك لە سنور دەرچوون. ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لە سەرئەوەی کە زۆربەی خەڵك فاسقو بێ دینە. پێم خۆشە لێرەدا ئەوە بزانین کە زۆربەی خەڵك باوەڕ ناهێنێت و زۆربەیان دوای ئایین ناکەون ، وە لە رۆژی قیامەتدا وەکو پێغەمبەری خوا دەفەرموێت لە ناو

هەزار نەفەردا یەك موسڵمانەو نۆسەدو نەوەدو نۆ كەس كافرن ، واتە: ئەگەر هەزار ملیار خەڵك هەبێت یەك ملیاری دەچێتە بەهەشتەوە نۆسەدو نەوەدو نۆ ملیاری دەچێتە جەهەنەمەوەو هەمو كەسێكیش جێگای هەیە لە هەردوو لادا ، جا ئەوەی كە بەهەشتیە یەك لە هەزارە، واتە: بێجگە لە جێگای خۆی جێگای (٩٩٩) كەسی جەهەنەمی دەدرێتێ بەڵام جەهەنەمیەكان جێگای یەك موسڵمان دابەش ئەكرێت بە سەر (٩٩٩) كەس دا ئاشكرایە كە جێگای لێ تەنگ دەكرێتەوە هەرچەند جەهەنەم بەو حاڵەش كە ددانێكی كافر بە ئەندازەی چیای ئوحودو قایمی پێستەكەی بەئەندازەی سێ رۆژ رێگایە بۆیە اللہ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ ﴾ الفرقان: ١٣ / هەركاتێ بەسەرو قاچ بە یەكەوە بەسراو خرانە ناوجێگایەكی زۆر تەنگە بەرەوە ﴿ ئەوەشمان لەبیر نەچێت كە اللہ لە قورئاندا دەفەرموێ: وەختێك كە جەهەنەم لە جەهەنەمیەكان پڕ دەكرێت دەفەرموێ:﴿ ئایا پڕ بویت؟ دەڵێ خوایە زیادەی تر هەیە؟﴾ ق / ٣٠. واتە هێشتا پڕ نابێت، ئینجا اللہ قاچی خۆی دادەنێت لەسەرئەو شوێنەو دەروخێتو جەهەنەم جێگای خاڵی نامێنێت. ئینجا دەڵێ: ئەی خوایە بەسە بەسە، جا نەڵێن: ئەگەر تەنگە چۆن فراوانەو ماوەتەوە؟ وە ئەگەر فرەوانە چۆن تەنگە؟ چونكە جێگای كافر تەنگەو زیندانی تایبەتیەتی ، ئەگینا جەهەنەم خۆی زۆر گەورەیە ، خۆ هەر لەدنیادا ناوی چەندین زیندانی گەورەت بیستوە كەبە سەدان جێگای تەنگی یەك نەفەری تێدایە؟ بەڵام موسڵمان وەك كافر نیەو موسڵمان ئەو كاتە شەست مەتر باڵای بەرزە لە حەوت مەتردا.

(٥٠) ئایا ئێوە حوكمی نەفامەكانتان مەبەستەو ئەوتان دەوێت؟ وە ئایا كێ هەیە لە اللہ جوانتر یاسا دابنێت بۆ گەلێك كە یەقینی هەبێت؟ بەڵێ اللہ هەرچی حوكمو فەرمانە بێجگە لە حوكمو بەرنامەكانی خۆی هەموی بە جاهیلی دادەنێت بە راستی دەبێ واش بێت، چونكە هەرچی حوكمی مرۆڤە حوكمێكی نەزانانەیە ، چونكە دەوڵەمەند یاسا بە گوێرەی بەرژەوەندی دەوڵەمەند دادەنێتو هەژاریش یاسا بە گوێرەی بەرژەوەندی هەژار دادەنێت ، واتە: هەر تاقمو پێڕێك بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی یاسا دادەنێت سەرەڕای ئەوەش ئەوانەی كە یاسا دادەنێن نازانن ئایندە چی روودەداتو چی دەبێت كەچی خەریكی دانانی یاسان بۆی ئایا ئەمە نەزانی نیەو یاسایەكی نەزانانە نیە؟ (ابن ابی حاتم) دەڵێ (ابو عبیده الناجی) وتی: بیستم لە حەسەنەوە كە دەیوت: (مَنْ حَكَمَ بِغَيْرِ حُكْمِ اللهِ فَحُكْمُ الجَاهِلِيةِ/ هەر كەسێك حوكم بكات بە حوكمێكی غەیری حوكمی خودا ئەوە حوكمێكی نەفامانەیە) ئەی

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٥١) فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ (٥٢) وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ (٥٣) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ (٥٤) إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ (٥٥) وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزۡبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ (٥٦) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٥٧)

موسڵمانان ئایا ئەو زاتەی كە لە هەمو حاكمان حاكم ترەو لە هەمو كەس بە بەزەیی ترەو لە هەمو كەس زاناترەو لە هەمو شتێك بە تواناترەو لە هەمو كەسێكیش دادپەروەرترەو دروستكەرەو مرێنەری هەمو بەرەی ئادەمیزادە ئایا رەوایە یاسای ئەو واز لێ بهێنیتو پەیرەوی یاسای بەشەرێكی وەكو خۆت بكەیت؟! پێغەمبەرمانﷺ لەم بارەوە دەفەرموێ: {أَبْغَضُ النَاس إِلَى اللهِ ثَلَاثَةٌ مُلْحِدٌ فِي الحَرَمِ وَمُبْتَغٍ فِي الإِسْلَامِ سُنَةَ الجَاهِلِيةِ وَمُطِلبُ دَمِ امْرِئٍ بِغَيْرِ حَقٍ لِيَهْرِيقَ دَمَهُ /البخاري/ بوغزێنراوترین كەس لەلای اللہ سێ كەسن:

یەكەم ـ كەسێك كە خراپەكاری بكات لە ناو حەرەمی مەكەدا.

دووهەم ـ ئەو كەسەیە كە لە ناو ئیسلام دا هەوڵ بدات بۆ ئەنجام دانی رەوشتی سەردەمی نەفامی.

سێهەم ـ ئەو كەسەیە كە زۆر هەوڵ بدات بۆ ئەوەی خوێنی كەسێك بە نارەوا برێژێت} جا پاش ئەوەی كە باسی فەرمانی خۆی كردو هەمو فەرمانەكانی بێجگە لە خۆی بە فەرمانی جاهیلیو نەفامی پێ ناساندین وا جارێكی تر ئەودوو دوژمنە گەورەی موسڵمانانمان بۆباس دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(٥١) ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە هەرگیز جولەكەو گاور نەكەن بە دۆستو یارمەتی دەری خۆتان ئەوانە خۆیان هەندێكیان دۆستو یارمەتی دەری هەندێكیانن‌و هەر كەسێك لە ئێوە كەئەوان بكات بە دۆستی خۆی دەی بە راستی ئەویش لەوان

دادەنرێت بەبێگومان کەاللههەرگیز گەلی ستەمکاران ڕێنمایی ناکاتونایانگەیەنێت بەخۆشبەختی. ئینجا هەروەکو ئەمڕۆ کاتی خۆی لە ناو موسڵماناندا هەبوە دەیان وت: ئێمە نابێ دەست لەو جولەکەو گاورانە هەڵگرین چونکە ئەگەر تەنگانەیەکمان بە سەر دا هات ئەی کێ بە هەوارمانەوە دێت؟ و کێ یارمەتیمان دەدات؟ بۆیە ناچارین دەست لە دۆستایەتی ئەمانە نەکێشینەوە ، بەڵام ئەمە بۆچونێکی زۆر هەڵەیەو ئیشێکی تاوانەو حەرامەو الله دەفەرموێ:

(٥٢) تۆ دەبینی ئەی محمدﷺ ئەوانەی کە لە ناو دڵیان دا نەخۆشی هەیە نەخۆشی نیفاقو نەخۆشی ترسنۆکیو نەخۆشی تەماعی دنیاو نەخۆشی مەقامو دەیان شتی تر هەیەو حەز ناکات دۆستایەتی ئەوانی لە دەستی دەربچێت لەبەر ئەوە زۆر پەلە دەکەن بۆ دروستکردنی پەیوەندی نێوانیانو خۆبەستنەوە بەوانەوەو دایان دەنێن بە دۆستو جێگای ڕازو نیازی خۆیانو دەڵێن: دەترسێین کە دووچاری بەڵابببین کە ئێمە ناچار بین بە ئەوان ، دەی نزیکە الله سەرکەوتنێك بدات بە موسڵمانان یان بارودۆخ بە سودی موسڵمانان بسوڕێتەوەو ناڵەباریو هەڵقە لە گوێی ئەو کەسانەش دەربکەوێت ، جا ئەو کاتە پەشیمان دەبنەوە لە سەر ئەو ئیشانەی کە بە شێوەیەکی ژێر بە ژێری کردویانە، هەندێك دەڵێن: ئەم ئایەتە سەبارەت بە دوو کەس بو کە پاش ڕوداوی ئوحود یەکێکیان وتی: من دەچم بۆ لای فلان کەسی جولەکە بەڵکو بمپارێزێو دەبم بە جولەکە ئەوی تریان وتی: منیش دەچم بۆ شام بۆ لای فلانە کەسی گاورو دەبم بە گاور بەڵکو بمپارێزێ خوایش ئەم ئایەتەی ڕەوانە کردو ڕونی کردەوە کە ئەوە هەوڵێکی نەزۆکەو نابێ خاوەن باوەڕ شتی وا بکات، هەندێکیش دەڵێن: دەربارەی عەبدوڵا ی کوڕی ئوبەی موناڧق دابەزیوە کە وتی: لە گۆڕانی زەمان دەترسمو هەرگیز دەست ناکێشمەوە لە دۆستایەتی جولەکە.

(٥٣) ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە دەڵێن: ئا ئەوانە مەگەر کەسانێك نەبوون کە سوێندی گەورەیان دەخواردو دەیان وت: ئێمە لە تەك ئێوە داین کەچی دەرکەوت درۆ دەکەنو لە تەك دەستەو بەستەی ترنو دورن لە موسڵمانان، خۆ کردارە چاکەکانیان هەڵوەشایەوەو هیچیان بەدەستەوە نەما ، جا بون بە مرۆڤێکی زیان لێ کەوتو. ئەمە چ بۆ دنیا بێت چ بۆ دوا ڕۆژ دەگونجێت. الله وا جارێکی تر بانگی باوەڕداران دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٤) ئەی باوەڕداران ئەگەر هەر کەس لەئێوە پاشگەز ببێتەوە لە ئایینەکەی خۆی ئەوە بەم زوانە الله گەلێك دەهێنێت کە خوا ئەوانی خۆش ئەوێتو ئەوانیش خوای خۆیان خۆش دەوێت کە لەگەل باوەڕداراندا زۆردڵ نەرمو بێ دەعیەوفیزنو بەرامبەر بە کافران زۆر عەزیزو دڵ ڕەقن، ئەمانە جیهاد دەکەن لە ڕێگای خواداو لە لۆمەی لۆمە کەران ناترسن. بە ڕاستی موسڵمانی موجاهد ، چونکە هەمیشە هەر لە خەباتو تێکۆشان دایەو کەمتر بیر لە سودی دنیایی دەکاتەوە خەڵکی بە تایبەت خزمانی خۆی سەدان ناوو ناتۆرەی پێوە دەنێن ، بەڵام ئەوانەی کە جێگای ڕەزامەندی خوا بن بۆ ئیشی جیهادی خۆیان هەرگیز بیر لەو سەرکۆنەو تانەو تەشەردانە ناکەنەوەو خەباتو ڕەزامەندی خوایان لە هەمو شت بەلاوە گرنگترە ، ئا ئەو وەسفە باشانە لە هەر کەسێك دابو ئەوە بەرەکەتو هێزی خوایەو داویەتی پێیو بەو وەسفە جوانانە نەخشاندویەتی، الله بەهەرەو نیعمەتەکانی فرەوانەو زانایە بەوانەی کە شایستەی ئەو نیعمەتانە بنو ئەوانەش کە شایستە نەبن، ئەبو سەعیدی خودری ئەڵێ پێغەمبەری خوا فەرموی: {ألا لا يَمْنَعن أحَدَكُمْ رَهْبةُ الناس أنْ يَقُولَ بِحَق إذَا رَآهُ أوْ شَهِدَهُ فَإنهُ لا يُقربُ مِنْ أجَلٍ وَلا يُبَاعِدُ مِنْ رِزْقٍ أنْ يَقُولَ بِحَق أوْ يُذكرَ بِعَظِيم/رواه ا د/ ئاگادار بن با ترسان لە خەڵك هیچ کام لە ئێوە بەرگری نەکات لە وتنی شتی ڕاستو دروست هەر کاتێ دی یان ئامادەی بو ، چونکە بە هیچ شێوەیەك مەرگ نزیك ناکاتەوەو ڕۆزیش دور ناخاتەوە ئەگەر قسەی حەق بکات یان پەندو ئامۆژگاری خەڵك بکات بە قسەی گرنگو ترساندن لە خاوەن دەسەڵاتی گەورە کە الله یە. ئینجا پاش ئەوەی کە خوای داناو زانا بەرگری کردین لەوەی کە جولەکەو گاور بکەین بە دۆستو یارمەتی دەری خۆمان بانگمان دەکات بۆ ئەوەی دۆستو یارمەتی دەری خۆمان باش بناسینو دەفەرمێ:

(٥٥) دۆستو یارمەتی دەرتان هەر اللهو پێغەمبەرەکەیو ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە ئەوانەی کە نوێژ دەکەنو زەکات دەدەن لەحاڵێکدا کە ئەوان گەردنکەچن بۆ خوا. دەڵێن پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی: {لَا تُصَاحِبْ إلا مُؤْمِنًا وَلَا يَأْكُلْ طَعَامَكَ إلا تَقِي /رواه الترمذی وغ ه وحسنه الألبا / با ڕەفیقایەتی بێجگە لە باوەڕ دار نەکەیتو با خواردنەکەت بێجگە لە پارێزگار کەسێکی تر نەیخوات.

(٥٦) ئەوسا ئەو کەسانەی کە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺو ئەوانەی کە باوەڕدارن بکەن بە سەرپەرستو دۆست بۆ خۆیان ئەوانە حیزبو دەستەو کۆمەڵی خوادنو بەراستیش هەردەستەو حیزبو کۆمەڵی خودایشە سەر کەوتو، واتە: ئاییندە بۆ باوەڕدارانی ڕاستەقینەیە دوژمن چ بیەوێتو چ نەیەوێت.

(٥٧) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە هەرگیز ئەوکەسانەی کەوا گاڵتە دەکەن بەدینەکەتان نەیکەن بەدۆستی خۆتان. لە کێ؟ لەوانەی کەکتێبیان پێ دراوە لەپێش ئێوەدا کە جولەکەو گاورەکانن هەروەها خوانەناسەکان، وە لە خوا بترسن ئەگەر باوەڕدارن. بەڵێ پاش ئەوەی کە فەرموی ئەوانەگاڵتە بە ئاینەکەتان دەکەن سیفەتێکی تری ئەوانەمان بۆباس دەکات ودەفەرموێ:

(٥٨) خۆ هەر کاتێك کەئیوە بانگتان کردن بۆ نوێژ گاڵتەو گەمە دەکەن بەنوێژو بەوبانگەی ئێوە، ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە ئەوان گەلێکی بێ عەقڵو نەزانن. جا ئەی موسڵمانان کەسێك کە خوا دەفەرموێ: بێ عەقڵو نەزانە کەی ڕەوایە کە تۆ خۆت بدەیتە دەستی؟!.

(٥٩) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب ئایا ئێوە ڕقتان لە ئێمەیەو ئێمەتان خۆشناوێ هەر لە بەر ئەوەی کە باوەڕمان هێناوە بە خواو بەوەی کە ڕەوانە کراوەتەلامانو بەوەش کە ڕەوانە کراوە لە پێشدا؟ خۆ بە بێگومان زۆربەشتان فاسقوسنوربەزێنن.

(٦٠) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئایا هەواڵی پاداشتی لەمە خراپترتان پێ بدەم لە لای خودا؟ ئایا کێ هەیە شەرمەندەو خراپتر لەو کەسەی کە اللّٰه لەعنەتی لێ کرد بێو غەزەبی ڕژاندبێت بە سەریداو هەندێ لەوانی کردبێ بە مەیمونو بەرازو بەندایەتی تاغوت بکات؟ ئا ئەوانە خراپترین جێگایان هەیەو لاڕێوگومڕاترن لە ڕێگای ڕاست. جا ئایا ئەمانە حەقە گاڵتەیان پێ بکرێت یان ئێمەی باوەڕدار بە خواو بە پێغەمبەرانو تەواوی کتێبان؟ سیفەتێکی تریان باس دەکات کە ئەوانە ترسنۆکن، ڕیا بازن درۆزننو دەفەرموێ:

(٦١) خۆ هەرکاتێك دێنە لاتان دەڵێن: ئێمەش باوەڕمان هێناوە، بە حەقیقەت ئەوانە بەکافری دێنە لاتانو کاتێکیش کە دەگەڕێنەوە هەر بە کافری دەگەڕێنەوە، وە اللّٰه زانایە بەوەی کە ئەوان دەی شارنەوە لە ناو دڵی خۆیاندا.

(٦٢) جا تۆ دەبینی زۆربەی ئەوان پەلە دەکەن لە تاوانو دوژمنایەتیو لە خواردنی ماڵی حەرام دا بە ڕاستی ئیشێکی خراپ دەکەن.

(٦٣) ئەوە بۆچی خوا پەرستانو زانایان بەرگری ناکەن لەو گوناهانەی کە گەلەکەیان دەیڵێنو لەو ماڵە حەرامانەی کە دەیخۆن بە ڕاستی ئەو زانایانە ئیشێکی خراپ دەکەن. ئەمە

وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ (٥٨) قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ (٥٩) قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ (٦٠) وَإِذَا جَآءُوكُمْ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ ۚ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا۟ يَكْتُمُونَ (٦١) وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ (٦٢) لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ (٦٣) وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ۚ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ (٦٤)

ئەگەر چی بۆ خوا پەرستانو زانایانی جولەکەو گاورە، بۆ ئەم گەلەیش هەروایەو دەبێ هەمومان هەوڵ بدەین کە بە گوێی فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ بکەینو لە بەرامبەرئیشە خراپەکان دا بێ دەنگ نەبین پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {مَا مِنْ رَجُلٍ يَكُونُ فِي قَوْمٍ يُعْمَلُ فِيهِمْ بِالْمَعَاصِي يَقْدِرُونَ عَلَى أَنْ يُغَيِّرُوا عَلَيْهِ فَلَا يُغَيِّرُوا إِلَّا أَصَابَهُمُ اللَّهُ بِعَذَابٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَمُوتُوا / ابو داود، ابن ماجة، حسنه الألبا / هیچ پیاوێك نیەکە لە ناو گەلێك دابێت کەتاوانی تێدا بکرێت لەحاڵێکدا کەبتوانن بیگۆڕنو نەیگۆڕن مەگەر خوا ئەو گەلە دوچاری سزایەك بکات بەر لەوەی بمرن. سیفەتێکی تری پیسی جوەکانمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٦٤) جوەکان دەیان وت: دەستی خوا بەستراوە ، خوا شت نادات بە خەڵكو ڕزقی خۆی گرتوەتەوە ، دەستی خۆیان بەستراوەو نەفرین لێ کراون بە هۆی ئەو قسە خراپەی کە کردیان، نەخێر وانیە بەڵکو هەردوو دەستی خوا بلاوەو دەبەخشێت چۆنی ئارەزۆ لێ بێت ، وەبەراستی گەلێك لەوان بە بۆنەی ئەوەی کە ڕەوانە کراوەتە لای تۆ لە لایەن پەروەردگارتەوە لە بەر ڕقو ڕژدیان زیاتر بەرەو سەرکەشیو کافر بون چوون، ئەم قسەو کردارە ناپەسندەی ئەوان بو بە هۆی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ئێمەش دوژمنایەتیو ڕقو قینمان خستە نێوانیانەوە هەتا قیامەتو هەر کاتێك ئەوان ئاگری شەڕیان هەڵ دەگیرساند اللّٰه ئەو ئاگرەی دەکوژاندەوە ، واتە: هەمیشە دەیانەوێت شەڕ لە نێوانی

موسڵمانان دا دروست بکەنو هەمیشە هەوڵی ئەوە دەدەن کە لە سەر ئەم زەویەدا خراپەو ئاشووب بەرپا بکەن ، بە راستی خوا خراپەکارانی خۆش ناوێت. ئەوەتە هەمیشە فرتو فێڵی ئەو خراپکارانە ئاشکرا دەکاتو رسوایان دەکات. ئینجا دەفەرموێ:

(٦٥) جا ئەگەر ئەهلی کتێب باوەڕیان بهێنایەوەو لە خوا بترسنایە بەراستی ئێمە هەمو خراپەی ئەوانمان دا دەپۆشیو لێیان خۆش دەبوین، وە بەراستی ئەمان خستنە ناو بەهەشتانی نازوو نیعمەتەوە. ئەمە وەڵامی سوێندێکی لابراوە واتە سوێند بێ لە هەمو گوناهیان خۆش دەبوینو دەمانخستنە ناو ئەو بەهەشتەوەو دەگەیشتن بە هەمو ئاواتی خۆیان.

(٦٦) خۆ ئەگەر ئەوان بە گوێی تەوڕاتیان بکردایە لە کاتی خۆی دا و لە پاشان بە گوێی ئینجیلیان بکردایە و بە گوێی ئەوەیان بکردایە کە رەوانە کراوەتە لای ئەوان لە لایەن پەروەردگاریانەوە کە ئەم قورئانەیە، ئەگەر ئەمانەیان بکردایە بەراستی ﷲنیعمەتی خۆی لە سەرەوەو لە خوارەوە بۆ دەڕژاندن ئەمەیان نەکرد، بەڵام هەمویان وەکو یەك نین بەڵکو لە ناو ئەواندا کۆمەڵێکی باش هەیە کە بە گوێی ﷲ دەکەن، وە زۆربەیان ئیشی خراپ دەکەن. ئەمەش تێمان دەگەیەنێت کە ئەگەر هەمو خەڵك روبکەنە خواو ئایینی حەقو عیبادەت بکەن ﷲنیعمەتەکانی خۆی فرەوان دەکاتو هەرزانیو خۆشی دەهێنێت هەروەك لە فەرمودەی پێغەمبەری خوادا ﷺ هاتوە کاتێك کە عیسا دێتە خوارەوە چل ساڵ حوکم دەکات، چونکە ئەو کاتە هەمویان زیکری خواو بەندایەتی راستەقینە دەکەن ئەو کاتە ﷲتەنانەت ژاری مارەکان لا دەباتو منداڵ لە گەل ماردا یاری دەکات هەتا شیری شیرداران زۆر دەبێت کە شیری بزنێك بەشی بنەماڵەیەك دەکاتو شیری مانگاو وشتریش بەشی تیرەو هۆزێك دەکاتو هەنارێك بەشی چەند کەس دەکات واتە هەرزانیو گرانیو خۆشیو ناخۆشی بە هۆی خۆمانەوەیە ، ئینجا ﷲدەفەرموێ:

(٦٧) ئەی نێراوی خوا رایگەینە ئەوەی کە ناردومانەتە لات، وە ئەگەر هاتو وات نەکردو بچوکترین شتت رانەگەیاند ئەوسا هەروەکو هیچت لەو پەیامە رانەگەیاند بێت ئاوایە ، وە لەکەس مەترسە چونکە ﷲ دەتپارێزێت لە خەڵك. دەڵێن: کاتێك کە ئەم ئایەتە دابەزی حەرەسی هەبو کە لە ناو چادرێکا بو سەری هێنایە دەرو چەند کەسێك لە یارەکانی لە دەورو بەری چادرەکەدا بوونو فەرموی بڕۆنەوە من لەم ڕۆ بە دواوە هیچ پێویستیم بە نیگابان نیەو ﷲخۆی دەمپارێزێ لە خەڵك بە بێگومان کە ﷲ رێنمایی گەلی کافران ناکات. چونکە ئەوان کافرنو ئەگەر کافران زاڵ ببن بە سەر پێغەمبەرداﷺ مانای وایە ئاینەکەی خوا دەفەوتێ، خوا

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ (٦٥) وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْهِمْ مِنْ رَبِّهِمْ لَأَكَلُوا مِنْ فَوْقِهِمْ وَمِنْ تَحْتِ أَرْجُلِهِمْ ۚ مِنْهُمْ أُمَّةٌ مُقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِنْهُمْ سَاءَ مَا يَعْمَلُونَ (٦٦) ۞ يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ ۖ وَإِنْ لَمْ تَفْعَلْ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ ۚ وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ (٦٧) قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنْجِيلَ وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْكُمْ مِنْ رَبِّكُمْ ۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ مَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا ۖ فَلَا تَأْسَ عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ (٦٨) إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ هَادُوا وَالصَّابِئُونَ وَالنَّصَارَىٰ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَعَمِلَ صَالِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ (٦٩) لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَأَرْسَلْنَا إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَاءَهُمْ رَسُولٌ بِمَا لَا تَهْوَىٰ أَنْفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ (٧٠)

ناوی پێغەمبەرمان بە پەیامبەر ناو دەباتو پێغەمبەریش ﷺ هیچی نەشاردوەتەوەو ئەو ئایینەی هەمو راگەیاندوە. ئەمەش دەمکوتێکی توندە بۆ شیعەو هەموو بیدعەچییان.

(٦٨) پێیان بڵێ: ئەی ئەهلی کتێب بە راستی ئێوە لە سەر هیچ شتێك نین هەتا بە گوێی تەوراتو ئینجیلو ئەوەی کە رەوانە کراوەتە لاتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە کە قورئانە نەکەن ، وە بە راستی زۆرێك لەوان بە بۆنەی ئەوەی کە رەوانە کراوەتە لای تۆ لە جیاتی باوەڕ هێنان زیاتر لە سنور دەرچونو کافرتر بوون ، واتە: هەروەکو بو بە مایەی خێر بۆ باوەڕداران بوو بە مایەی شەڕ بۆ ئەهلی کتێب جاکەوابو تۆ ناڕەحەت مەبەو خەفەت مەخۆ لە سەر بەدبەختیو سەر شۆڕی کافران. ئینجا ﷲ سەبارەت بە باوەڕ داران دەفەرموێ: :

(٦٩) بێگومان ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بەم ئاینەی پێغەمبەرمانﷺ وە ئەوانەی کە جولەکە بوون لە کاتی خۆیو لە سەر ئاییی موسا بوونو راستیان کردوەو ئەوانەی کە لایان داوە لە هەمو شتێکی خراپەو بەتاڵو ئایینێکی سەربەخۆیان نەبوە، بەڵام هەرچیان بە چاك زانیوە ئەنجامیان داوەو ئەوکەسانەی کە ئاینی مەسیحیان لە سەردەمی خۆیدا بە رێکوپێکی گرتوە هەر کام لەو ناوانە کە باوەڕیان هێنابو بە خواو بە رۆژی قیامەتو ئیشی باشی کردوە ئیتر ئەوانە هیچ ترسێکیان نیە لە رۆژی قیامەتدا وخەم ناخۆن. واتە خوای میهرەبان تەماشای ناوو ناتۆرە ناکات تەماشای

دڵو کردار دەکات هەر کەسێك باوەڕی راستەقینەی هەبوو ئیشی چاکی کرد خوا پاداشتی دەداتەوە بە چەندین بەرامبەر زیاتر لە کارو کۆششەکەی خۆیو ستەم لە هیچ بەندەیەکی ناکات. جارێکی تر ﷲ بادەداتەوە سەر جوەکانو دەفەرموێ:

(٧٠) بە راستی ئێمە پەیمانێکی بتەومان وەرگرت لە کوڕانی یەعقوبو رەوانەمان کرد بۆ لای ئەوان پێغەمبەران، بەڵام هەر وەختێك پێغەمبەرێك دەهاتە لایانو ئامۆژگاری دەکردن بە شتانێك کە بە ئارەزۆی ئەوان نەبو، ئاشکرایە کە ئەوان هەرگیز راستیان نەویستوە ، جا هەر بۆیە ئەوان هەندێك لەو پێغەمبەرانەیان بە درۆ دەخستنەوەو کۆمەڵێکیشیان دەکوژن. نافەرموێ: ﴿فريقا قتلوا﴾ تا وا پیشان بدات کەوا ئێستەو لە مەولا ئەو کارە دەکەنو کارەساتەکە دێنێتە بەر چاو کە ئەمە بەشێکە لە رەوان بێژی قورئان کە شتی رابردوو دێنێتەوە بەر چاوو باسی دەکات بەڵێ ئەم جولەکە تاوانبارانە ئەم ئیشە پڕ مەترسیو تاوانبارانەیان دەکرد.

(٧١) وایان دەزانی کە بەمە دوچاری هیچ بەڵایەك نابن جاهەم کوێر بوونو هەم کەڕ لە پاشان تۆبەیان کردو ﷲ تۆبەی لێ وەرگرتن پاشان دووبارە زۆربەی ئەوان لە بیستنو بینینی حەقو راستی کوێرو کەڕ بونە وەﷲ بینەرە بەو ئیشەی کە ئەوان دەیکەن. جا ﷲ پاش ئەوەی کە هەندێ لە رەوشتە ناپەسندانەکانی جولەکەی باس کرد وا باسی هەندێ بیرو راو قسەی نابەجێی گاورەکانیش دەکاتو دەفەرموێ:

(٧٢) بەراستی کافرن ئەوانەی کە دەیان وت: خوا بریتیە لە عیسای کوڕی مەریەمو عیسایش وتی: ئەی کوڕانی یەعقوب عیبادەتی خوا بکەن کە پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەشە ، بەبێگومان هەر کەسێك هاوبەشی دانێ بۆ ﷲ، ئەوسا بەحەقیقەت ﷲ یش بەهەشت قەدەغە ئەکات لەو کەسەو جێگای ئاگری جەهەنمە. پێغەمبەرمانﷺ کابرایەکی ناردو فەرموی: جاڕ بدەو بڵێ: {أَلَا لَا يَدْخُلُ الجَنةَ إِلا نَفْسٌ مُسْلِمَةٌ /متفق عليه/ ئاگاداربن بە راستی ناچێتە بەهەشت مەگەر موسڵمان بێت} واتە: پێغەمبەران هەمویان یەك دەنگن لەوەدا کە موشریك ناچێتە بەهەشتەوە . وە بەم ئیشە نارەوایە دەبن بە ستەمکار، وەبۆ ستەمکارانیش هیچ یارمەتی دەرێك نیە. وە لە سورەتی نیسا لە دوو شوێن دا فەرموی ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ ﴾ / بەبێگومان خوا خۆشنابێت کە هابەشی بۆ دابنرێت﴾ بە راستی هاوبەشی دانان ستەمێکی ئێجگار گەورەیە وەکو خوا لە سورەتی (لقمان /١٣) لە سەر زمانی لوقمان بۆمان تۆمار دەکاتو دەفەرموێ: ﴿جا

وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ (٧١) لَقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۖ وَقَالَ ٱلۡمَسِيحُ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۖ إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ (٧٢) لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖۘ وَمَا مِنۡ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ وَإِن لَّمۡ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٧٣) أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسۡتَغۡفِرُونَهُۥۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٧٤) مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ (٧٥) قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ (٧٦)

بیر بکەرەوەو باس بکەن ئە کاتەی کە لوقمان بە کوڕەکەی وت کە ئامۆژگاری دەکرد: ئەی کوڕی خۆم هاوبەش دانەنێیت بۆ خوا بە راستی هاوبەشی دانان ستەمێکی زۆر گەورەیە﴾ ئەوەتە پێغەمبەرمان ﷺ لە یەکێ لە پاڕانەوەکانی دا دەفەرموێ: {ئەی خوایە بە راستی من پەنا ئەگرم بە تۆ لەوەی کە هاوەڵت بۆ دابنێمو خۆم بزانم ، وەداوای لێ بوردنت لێ دەکەم بۆ ئەوەش کە خۆم نەزانم} ئەم بەشەیان لە گاورەکان دەیان وت: هەر عیسا خوایەو بەشێکی تریان خوایان بە سێ دەزانیو مەریەمو عیسای کوڕی مەریەمیان بە دوو خوا دادەنا، خوایش دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ:

(٧٣) بە راستی کافر بوون ئەو کەسانەی کە وتیان: ﷲ سێ هەمی سێ کانە ، واتە: خواو عیساو مەریەم، وە جگە لەیەك خوای تاكو تەنها کە ﷲ یە هیچ خوایەکی تر نییەو ئەگەر واز نەهێنن لەوەی کە دەیڵێن با چاك بزانن کە سزایەکی دەردناك پێیان دەگاتو ئازاریان دەدات لە رۆژی دوایداو کۆتو زنجیر دەکرێنو دەخرێنە ناو ئاگرەوە. ئینجا ﷲ بە شێوەیەکی زۆر جوان بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: :

(٧٤) ئایا ئەوان هەروا سور دەبن لەسەر خوانەناسیو ناگەڕێنەوە بۆ لای خوای خۆیانو داوای لێ خۆشبونی لێ بکەن؟ بە راستی خوا خوایەکی لێ بوردەو میهرەبانە بەرامبەر مرۆڤەکان. واتە با تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێ خۆشبونی لێ بکەن، بە

قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾

راستی ئەمە نیشانەی سۆزو میهرەبانی خوایە بەرامبەر بە بەندەكانی لە گەل ئەو تاوانە گەورەیەدا كە عیساو مەریەم بە خوا دەزانن‌و دەیانكەن بە هاوەڵی خوا كەچی خوا هەڵیان دەنێت بۆ تەوبە كردن؟ ئینجا دەفەرموێ:

﴿٧٥﴾ عیسای كوڕی مەریەم بێجگە لەوەی كە پێغەمبەرێكی خوایە شتێكی تر نیە كە بەراستی پێغەمبەرانێك پێش ئەو چۆوون ئەویش وەكو ئەوان وایەو دایكیشی ئافرەتێكی راستگۆبووەو بێ باوك پەیدا بوە كە هەردووكیان خواردنیان دەخواردو كەسێكیش كەخۆراك بخوات ناگونجێت كە خوا بێت، چونكە خوا پێویستی بە خۆراك نیە، راستیش ئەوەیە كە پێغەمبەران تەنها لە پیاوان بوە، كەواتە مەریەم وەلیە نە پێغەمبەر، دەی تەماشا بكەو بزانە چۆن نیشانەكانی خۆمان رۆشنی دەكەینەوە بۆیان؟ لە پاشان تەماشاش بكە كەئەوان چۆن وا درۆ هەڵدەبەستن بە دەم ئێمەوە؟!

﴿٧٦﴾ پێیان بڵێ: ئایا بێجگە لە خوا شتانێك دەپەرستن؟ كە نە خاوەنی زیانێكن‌ونە خاوەنی سودێكن بۆتان؟! ئەگەر ژیر بونایە شتی ئاوەهاتان نەدەكرد، وە بە راستی خوا هەر خۆیەتی بیسەر و زانەر بۆ وتارو كردارەكانتان.

﴿٧٧﴾ پێیان بڵێ: ئەی ئەهلی كتێب زیادەڕەویی مەكەن لە ئایینەكەتان داو شتێكی نارەوا نەڵێن كە ئایینەكەتان نەیوتبێت‌و دوای ئارەزۆكانی گەلێك مەكەون كە ئەوان خۆیان هەر لەپێشدا گومڕاو سەر لێ شێواوبوون‌و زۆر خەڵكشیان گومڕا كردوەو خۆیشیان لە راستە شەقامی ئیسلام‌و ئایین لایان داوەو گومڕا بون. بەداخەوە ئەمڕۆ دەبینین سەدەها سوننەتی راستەقینەی پێغەمبەرﷺو دەیان فەرز تەرك كراوەو كەس بە خەیاڵیدا نایە وەك ئەوەی هیچ روی نەدابێت ، وە سەدەها بیدعەتیان بە ناوی ئایینەوە بڵاو كردوەتەوەو رەواجی پێ دەدەن‌و خەڵكی پێوە خەریك دەكەن‌و هەندێ جاریش خەرجی زۆری بۆ دەكەن، ئەگەر خوا ناسێكی راستەقینەو دڵسۆز بە خواو بە ئایین‌و لە پاشان دڵسۆز بە گەل‌و نەتەوەی وتی: ئەوە شتێكی داهاتوەو ئەوەندە خۆتانی پێوە خەریك مەكەن لە لای ئەم نەزانی خۆ بە زانا زانە دنیا كاول دەبێت‌و ئاسمان‌و زەوی بە وێرانی دەبینێ‌و لە هیچ تانەو تەشەرێكی نارەوا سڵ ناكات‌و دەیان بەڵگەی خۆ پەسەند بۆ نەزانان كەڵەكە دەكات‌و نەزانانی پێ رازی دەكات ئیتربیر لەوە ناكاتەوە كە چ تاوانێكی گەورەی ئەنجام داوەو بە ناو دینەوە یا لە دین دەرچووە یان خەریكە دەردەچێت، پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: (لاَ تُطْرُونِي كَمَا أَطْرَتِ النصَارَى عِيسَى بْنَ مَرْيَمَ ، وَلَكِنْ قُولُوا : عَبْدُ ا ـ وَرَسُولُهُ / متفق علیه/ لە سنوری خۆم دەرم نەكەن وەكو گاورەكان عیسای كوڕی مەریەمیان لە سنوری خۆی دەركرد من بێجگە لەوەی كە بەندەی خوداوەندم‌و رەوانە كراوی ئەوم شتێكی تر نیم}

جا تۆ ئەگەر راست دەكەیت‌و پێغەمبەرت خۆش دەوێت كە خۆشویستنی ئەركی سەر شانی هەمو موسڵمانێكە وەرە بە گوێی بكەو شتی تازە دامەهێنە ئەوەی زەمانی ئەو دین نەبو بێت هەتا قیامەت دین نیە ، رەبیعی كوڕی ئەنەس دەڵێت: بە راستی هی وا هەبوە كە ماوەیەك بە گوێرەی سوننەتی پێغەمبەرﷺ ئیشی كردوە جا شەیتان هاتوەتە لای‌و پێی وتوە تۆ هەر خەریكی شتێكی كە پێش تۆ كراوە كەواتە ئەوەندە وشك مەبە لە سەری، تۆ دەبێ شت دابهێنیت. وەك ئەمڕۆ دەڵێن: دەبێ ئیبتكارات هەبێت‌و خەڵك بانگ بكە بۆی ئەویش وای كرد لە پاشان زانی كە شتێكی خراپی كردوە، ویستی پەشیمان ببێتەوەو وازی لەو دەسەڵات‌و سەروەتە هێناو خەریكی بەندایەتی بووەوە چەند رۆژێك سەرگەرمی بەندایەتی بو جارێكی تر هاتنەوە لای‌و پێیان وت: ئەگەر تۆ خۆت پەشیمان بویتەوەو تەوبەت كردوە لە نێوان خۆت‌و خوادا نزیكە خوا لێت وەرگرێت ئەی چی بە فلان‌و فیسار دەكەیت كە تۆ كاتی خۆی تێكت داون‌و ئێستا مردون؟ كەواتە تەوبە بەهیچ شێوەیەك بۆ تۆ نیە. ئیبنو ئەبی حاتەم دەڵێت سەبارەت بەو كەسانەو وێنەیانە ئەم ئایەتە كە دەفەرموێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ﴾ جا با ئێمەش

بیر له خۆمان‌و بەرنامەکانمان بکەینەوەو نەبین بە هۆی گومڕا کردنی خۆمان‌و خەڵکیش ئەوەتە اللّٰه سەبارەت بەو زانایانە دەفەرموێ:

(٧٨) نەفرین کرا لەو کەسانەی کە کافر بوون لەنەوەی ئیسرائیل لە سەر زمانی داودو عیسای کوری مەریەم، چونکە سەرپێچی فەرمانی خوایان کردو دەست درێژ کار بون.

(٧٩) بەرگریان نەدەکرد لەو ئیشە خراپانەی کە دەیانکرد بە راستی ئیشێکی زۆر خراپیان دەکرد. جا با ئێمەش تەماشا بکەین‌و بزانین بۆ خوا نەفرینی کرد لەو زاناو خوا ناسانەی ئەو گەلە؟ چونکە ئیشی خراپ دەکراو زاناو خاوەن هێزەکان بەرگریان نەدەکرد ئایا بۆ ئەم سەردەمەی ئێمەو لە ناو ئەم خەڵکەی ئەمڕۆدا ئەو هەمو ئیشە خراپە دەکرێت‌و ئێمە لێی بێ دەنگین ئەگەر قورئان ئێستە بهاتایە خوارەوە چی بە ئێمە دەفەرمو؟ جا پێویستە بیر لە حاڵی خۆمان بکەینەوەو بزانین کە ئێمە واین لە لێواری ئاگرێکی زۆر پڕ مەترسیدا کە ئاگری جەهەنمە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ رَأَى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ /مسلم/
هەر کەسێ ئیشێکی خراپی دی با بەدەست بیگۆڕێت، وە ئەگەر بە دەست نەیتوانی با بە زمان بیگۆڕێت، وە ئەگەر بە زمان نەیتوانی با بە دڵ رقی بێ لەو ئیشەو ئەمەش لاخواروی باوەڕە، ئینجا دەفەرموێ:

(٨٠) تۆ دەبینی زۆربەی ئەوان ئەو کەسانەی کە خوانەناسن دەکەن بە دۆست بۆ خۆیان بە راستی شتێکی پیسە کەنەفسیان بۆیان جوان دەکات‌و پێشکەشیان دەکات ، کە دەبێ بەهۆی ئەوە کە اللّٰه رقی لێیان هەستێت‌و لە ناو سزادا بمێیننەوە بۆ هەمیشە. گەرچی مەبەستی جولەکەو گاورەکانە یان موناففقەکانی سەردەمی پێغەمبەرمانە ﷺ، هەروا ئەم ئایەتە بۆ هەر موسڵمانێکە کە ئەو ئیشە بکات‌و بێ باوەڕان بکات بە دۆست‌و یارمەتی دەری خۆی، ئینجا رێنماییان دەکات کە چی بکەن‌و دەفەرموێ:

(٨١) خۆ ئەگەر ئەوان باوەڕیان بهێنایە بە خواو بە پێغەمبەر ﷺ و بەوەی کە رەوانە کراوەتە لای ئەوپێغەمبەرە ﷺ هەرگیز ئەو کافرانەیان نەدەکرد بە دۆست‌و سەرپەرستی خۆیان بەڵام زۆربەیان لە سنور دەرچوون‌و سنوری راستی‌و ئاینیان بەزاندوە وکەمێکی بەسەلامەتی ماوەتەوە. ئەی ئەمڕۆ لە وڵاتی ئیسلامیدا ئەوکردارە نامۆیە ئەنجام نادرێت؟! وە ئایا کەس سڵی لێ دەکات؟! ئینجا دەفەرموێ:

وَإِذَا سَمِعُوا مَا أُنزِلَ إِلَى الرَّسُولِ تَرَىٰ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ الدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا مِنَ الْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ الشَّاهِدِينَ (٨٣) وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَمَا جَاءَنَا مِنَ الْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ الْقَوْمِ الصَّالِحِينَ (٨٤) فَأَثَابَهُمُ اللَّهُ بِمَا قَالُوا جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ (٨٥) وَالَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِآيَاتِنَا أُولَٰئِكَ أَصْحَابُ الْجَحِيمِ (٨٦) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحَرِّمُوا طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوا ۚ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ (٨٧) وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنتُم بِهِ مُؤْمِنُونَ (٨٨) لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٨٩)

(٨٢) ئەی محمد ﷺ سوێند بە گەورەیی خۆم دوژمن ترین کەس بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە جولەکەو ئەو کەسانەن کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوەونزیکترین کەس بۆ دۆستایەتی لە نێوان خەڵکا سەبارەت بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە ئەو کەسانەن کە خۆیان بە گاور دادەنێن چونکە لە ناو ئەوان دا زانایان‌و گۆشە گیرهەیەو ئەوان خۆیان بە گەورە ناگرن. لە راستی دا چوار شت دەبێت بە هۆی لادان لە ئایین‌و دژایەتی کردنی‌و بە سوك تەماشا کردنی پەیڕەوانی: یەکەم ـ نەزانی (الجهل). دووهەم ـ خۆشەویستی دنیا. سێهەم ـ حەسودی. چوارەم ـ خۆ بە گەورە گرتن. گاورەکان زانایان هەبو ، وە لە ناو ئەوانیشدا کەسانێك هەبون کە بە تەواوی وازیان لە دنیا دەهێناو هەر خەریکی بەندایەتی دەبون، واتە: لە نەزانی‌و دنیا ویستی‌و خۆ بە گەورە گرتن دور بوون بۆیە زووتر باوەڕیان دەهێناو رێزیان لە ئایین دەگرت ، ئەوە بوو نەجاشی چۆن رەفتاری کردلە تەك یارە کۆچەریەکانی حەبەشەدا وموقەوقیس چۆن وەڵامی نامەی پێغەمبەری ﷺ دایەوە، بەڵام جولەکە چەندین جار هەوڵی کوشتنی پێغەمبەریان داو سیحریان لێ کرد و بەدژی ئەو هاوکاری بت پەرستانیان دەکرد ، بۆیە خوا سەبارەت بە گاور دەفەرموێ:

(٨٣) خۆهەر کاتێك کە دەیبیسن ئەوەی کە رەوانە کراوەتە لای پێغەمبەر ﷺ و گوێیان لە قوئان دەبێت تۆ دەبینی چاویان فرمێسکی پێدا دێتە خوارەوە لە بەر ئەو راستییەی کە

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٩٢﴾ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾

ناسیویانەوو دەزانن کە ئەوە حەقو راستە، جا دەڵێن ئەی پەروەردگارمان ئێمە باوەڕمان هێناوەو بمان نوسە لە گەڵ ئەو کەسانەی کە شایەتن کە ئۆمەتی محمدە ﷺ ، چونکە ئەوان لە کتێبی خۆیاندا باسی ئەم پێغەمبەرەیان بۆ کراوەو دەزانن کە ئەمە چەند پایە بەرزە لە لای خواو لە سەروی هەمو ئۆمەتەکانی ترەوەیەو دەڵێن :

(٨٤) بۆ دەبێ کەئێمە باوەڕ نەهینین بە خواو بە ئەوراستییەی کە هاتوتە لامان لە گەڵ ئەوەدا کە ئێمە بە تەماین کە پەروەردگارمان بمانخاتە ناو گەلی ساڵحوچاکانەوە؟

(٨٥) جا بە هۆی ئەوەی کە بەو شێوە باوەڕیان هێنا خواش پاداشتی ئەو هەڵوێستو قسەجوانانەی پێدانەوە بە بەهەشتانێك کە لە ژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگە دەڕوات کەبۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو ئەوەیە پاداشتی چاکەکاران. جا ئەو مۆژدەیە بۆ هەمو کەسێکی چاکە لە هەمو سەردەمێکدا ئەگەرچی لێرەدا سەبارەت بەو گاورانە دابەزی وە، چونکە هۆی دابەزین شتی گشتی تایبەت ناکات وتراوە:" **العـ ة بعموم اللفظ لا صوص السبب**/ کەڵك لە گشتی وشە وەردەگیرێت نەك لە تایبەتی هۆکە". ئینجا ﷲ پاش باسکردنی پاداشتی باوەڕ داران باسی سزای بێ باوەڕان دەکاتو دەفەرمویّ:

(٨٦) ئەو کەسانەی کە کافرو بێ باوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە ئەوانە رەفیقی دەستە ملی ئاگری جەهەنمن.

(٨٧) دەگێڕنەوە دەڵێن: هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بو کە کۆمەڵێك لە یارەکانی پێغەمبەری خواﷺ بۆ زیاتر بە ندایەتی کردن هەندێکیان بڕیاریان دا کە ژن نەهێننو هەندێکیان ، وتیان: گۆشت ناخۆینو هەندێکیان وتیان ناخەوین لەسەربەرە، جا ئەم هەواڵە گەیشتە پێغەمبەرمانﷺو ناردی بە دوایانداو هاتنو فەرموی: ئێوە ئاوەهاتان وتوە؟ وتیان: بەڵێ. پێغەمبەرﷺ فەرموی: {**لكني أصلي وأنام وأصوم وأفطر وأتزوج النساء فمن رغب عن سنتي فليس مني**/منفق عليه/ بەڵام من شەو نوێژ دەکەمو ئەیشخەومو رۆژو دەگرمو هەندێ جاریش بە رۆژو نابمو ژن دەهێنم ئەوسا هەر کەسێك لە رەوشتی من لابدات لەمن نیە} جا خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە قەدەغە مەکەن لە سەر خۆتان ئەو شتە پاکانەی کە خوا حەڵاڵی کردوە بۆتانو لە سنور دەرنەچنو چیتان بۆ دانراوە ئاوەها بکەن نە زیادو نەکەم لە بڕیاری حەڵاڵو حەرام لا نەدەن بە راستی خوا دەست درێژی کەرانو سنور بەزێنانی خۆش ناوێت. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٨٨) بخۆن لەوەی کەخوا پێیداون ئەوەی کە حەڵاڵەو پاکە واتە پێویستە لە خواردندا دووشت لە بەر چاو بگیرێت: یەکەم ـ حەڵاڵ بێت. دووهەم ـ پاك بێت. بۆ نمونە: لوقمەیەکی حەڵاڵ ئەگەر کەوتە ناو هەندێ شتەوە کە تەبیعەت نەیبات حەق نیە بخورێت یان شتێکی حەڵاڵ وەکو بزن مژەو کوللە هەرچەندە حەڵاڵن، بەڵام کەسێ نەیخوارد بێتو بێزی لێ ببێتەوە با نەیخوات، چونکە ئەگەر چی حەڵاڵە بەڵام بۆ ئەوان چاك **(الطیب)** نیە، ئینجا دەفەرموێ: جا بترسن لەو خوایەی کە ئێوە باوەڕتان پێی هەیەو نە حەڵاڵ حەرام بکەنو نە حەرام بە حەڵاڵ دانێن چونکە هەردوو تاواننو دەست درێژیە لە سەر مافی پەروەردگار، چونکە هەر ئەو مافی حەڵاڵو حەرامکردنی هەیە ﴿أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ﴾ الأعراف: ٥٤ / ئاگادار بن تەنها بۆ خوایە دروستکردنو هەر بۆ ئەویشە فەرمان﴾ ئینجا ﷲ یاسای سوێندمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٨٩) خوای میهرەبان تۆڵەتان لێ ناسێنێ لە سەر سوێندێك کە لە خۆیەوەیەو بە دەمتاندا دێتو مەبەستتان سوێند خواردن نییە وەك (نەوەڵڵا و ئەرێ وەڵڵا) بەڵام خوا حیسابی سوێندێکتان لە سەر دەکات کە بە دڵ دەتانەوێ سوێند بخۆنو بڕیار بدەنوئینجا سوێند بخۆن، جا ئەو سوێندە ئەگەر بۆ ئیشێکی رەواو دروستبو نابێ بیشکێنن، وە ئەگەر بۆ شتێکی نادروستبو وەك ئەوە کابرا

سوێند بخوات کە قسە لەتەك باوكیا نەكات ئەوە دەبێ سوێندەكەی بشكێنێ ، وەئەگەر سوێندەكەی لە سەر شتێكی موباح خواردو ویستی بیشكێنێ ئەم دوو بەشە دەبێ تۆڵەی سوێند شكانەكە بدەن كە تۆڵەكەیشی بریتیە لە خواردنی دە هەژار لەناوەڕاسترین ئەو خواردنەی كە دەیدەن بە منداڵو خێزانی خۆتان واتە خواردنێكی نەزۆر لەڕو نە زۆر قەڵەو یان لیباسیان بۆ بكڕێت، واتە: لیباسی دە فەقیر لیباسیش ئەوەیە كە بەدەنیان داپۆشێو بتوانن نوێژی پێ بكەن یان بەندەیەك ئازاد بكەن ، جا كابرا خۆی سەرپشكە لە ئەنجام دانی یەكێك لەو سێ شتانە هەر كامیان ئەنجام بدات باشە، بەڵام ئەگەر تونای ئەنجام دانی هیچ كامیانی نەبو ئەوە سێ رۆژ رۆژوو پێویستە لە سەری‌و دەبێ بیگرێ، ئینجاﷲ دەفەرموێ: ئەوەی كە باس كرا كەفارەتی سوێندەكانتانە ئەگەر شكاندتانو دەفەرموێ: كاتێك كە سوێند دەخۆن سوێندەكانتان بپارێزنو نەیان شكێنن هەر ئاوەها خوا نیشانەكانی خۆی باس دەكات بۆتان بەڵكو ئێوەش سوپاسی خوا بكەن. ئینجا ﷲ یاسای قەدەغە كردنی ئارەقو قومارو بتو سپاردنی تەقسیمات بە شتی خەیاڵی باس دەكاتو دەفەرموێ:

(٩٠) ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە مادە سڕكەرەكان وقومارو بتەكانو پیاڵەدیاری كراوەكانی بەشكردن شتانێكی پیسن لە كردارەكانی شەیتانن دەی دوور بكەونەوە لەو كردارە پیسە بەڵكو رزگار ببن لە دەستی فڕو فێڵی شەیتانو شەیتان سیفەتانو رزگار ببن لە سزاو تۆڵەی سەختی دوا رۆژ.

(**ا مر**) بە داپۆشەر دەڵێن وەك چۆن بە سەرپۆشی ئافرەت دەوترێت (**خمار**) ئەمیش ئەو ناوەی بۆ دانراوە، چونكە ژیری دادەپۆشێتو مەستی دەكاتو لەو كاتەدا عەقڵی بە هیچ ناشكێتو ئاگای لە خۆی نیە چی دەكاتو چی لێ دەكرێت ، جا كەی ژیرانەیە مرۆڤ بە دەستی خۆی‌و بە ماڵی خۆی خۆی ئاوا لێ بكات كە ببێ بە هۆی گاڵتە پێ كردنی؟ تەماشا كەن كەئیسلام چەند دڵسۆزە بۆ مرۆڤو چۆنی دەپارێزێت لە شتی عەیبەو ناشیرین ، پێویستە ئەوەش بزانین كە هەر شتێك مرۆڤ سەر خۆش بكات ئەوە ( ر)ەو هەرچی مرۆڤ سەر خۆش بكات بابەسەتلێكیش بێت ئەوەقومێكیشی حەرامە، قومار بە هەمو شێوەكانیەوە حەرامو قەدەغەیە نابێ باوەڕداران نزیكی بكەونەوە تەنانەت ئەگەر لە سەر بردنەوەو دۆڕانیش نەبێت باوەڕدار مافی نزیك كەوتنەوەی نیە وەك پێغەمبەرمان ﷺ سەبارەت بە تاوڵە دەفەرموێ: {مَنْ لِعبَ بِالنرْدَشِ ِ فَكَأَنمَا صَبَغَ يَده ِفِي لَحْم خِنْزِير وَدَمه /مسلم/ هەر كەسێك یاری تاوڵە بكات وەك ئەو كەسە وایە كە دەستی خۆی بە گۆشتی بەرازو خوێنەكەی رەنگ كردبێت}ئینجا خوا زیاتر پیسی ئارەقو قومار رۆشن دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(٩١) شەیتان دەیەوێت دوژمنایەتی ورقوقین دروست بكات لە ناو ئێوەدا بە بۆنەی عارەقو قومارەوەو بەرگریتان بكات لە یادی خوا. دەبینی كابرا سێ سەعات بەڵكو زیاتریش خەریكی قومار دەبێتو ئاگای لە هیچی تر نامێنێت ، وە یان كابرا عەرەق دەخواتەوە چەند سەعاتێك سەر خۆشە نەك ئاگای لە نوێژ نامێنێ بەڵكو ئاگای لە خۆیشی نامێنێ دەی ئایا ئیتر ئێوە واز ناهێنن؟ دەڵێن كە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە پێغەمبەرمانﷺ فەرموی عومەرم بۆ بانگ بكەن كاتێ كە هات ئەم ئایەتەی بۆ خوێندەوە هەتا گەیشتە ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾ عومەر وتی:"**يا ربنا انتهينا، يا ربنا انتهينا** / ئەی پەروەردگارمان وازمان هێنا ئەی پەروەردگارمان وازامان هێنا" دوای ئەمە كە عومەر وتی: وازمان لێهێنا، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ رۆیشت بۆ لای نادیەكەیانو ئەم ئایەتەی خوێندەوەو دەڵێن: هی وا هەبو نیوەی ئارەقەكەی خواردبویەوە هی وایش هەبو بە سەر دەمیەوە بو كە ئەم ئایەتەیان بیست ئەوەی كە بە سەردەمیەوە بو ئەوەی كە هیچی لێ نەخواردبو ئەوەی كە نیوەی كردبو هەمویان رژاندیان دەڵێن: ئەو رۆژە لە مەدینەدا ئەوەندە ئارەق رژا كۆڵانەكانی مەدینە لافاوی لێ هەڵنیشت جا ئەوە سیفەتی موسڵمانانی سەردەمی پێغەمبەرمانﷺ بو، موسڵمانانی پێشوو كاتێك كە خوا دەی فەرمو فلانە شت حەرامە وازیان لێ دەهێنا بەڵام بە داخەوە ئەمڕۆ هەزاران شت دەزانین حەرامەو پێیشی دەوترێت مەیكە هەر دەیكات جا ئەمە لە كوێ‌و ئەوە لە كوێ؟ ئینجا خوای دانا دەفەرموێ:

(٩٢) پەیڕەوی فەرمانەكانی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ بكەنو بترسن لە تۆڵەو سزای خودا ، جا ئەگەر ئێوە پشتتان لێ هەڵچەرخاند سا بزانن لە سەر پێغەمبەرەكەی ئێمەش تەنها راگەیاندنی ئاشكرا پێویستەو هیچی تر.

عەبدورەحمان ی كوڕی وەعلە دەڵێ: پرسیم لە ئیبنو عەباس لە بارەی شەرابەوە ئەویش وتی: پێغەمبەری خواﷺ دۆستێكی هەبو لە سەقیف یان لە دەوس لە ساڵی فەتحدا لە مەكە هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو كونەیەك شەرابی بە هەدیە بۆ هێنابو ،پێغەمبەرﷺ فەرموی: {يَا أَبَا فُلَانِ أَمَا عَلِمْتَ أَن اللَهَ حَرمَهَا فَأَقْبَلَ الرجُلُ عَلَى غُلَامِهِ فَقَالَ اذْهَبْ فَبِعْهَا فَقَالَ رَسُولُ اللهِ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ يَا أَبَا فُلَانِ بِمَاذَا أَمَرْتَهُ قَالَ أَمَرْتُهُ أَنْ يَبِيعَهَا قَالَ إِن الذِي حَرمَ شُرْبَهَا حَرمَ بَيْعَهَا فَأَمَرَ بِهَا فَأُفْرِغَتْ فِي الْبَطْحَاءِ؟/ رواه ا د ومسلم وغ ا/ ئەی باوكی فلانە كەس ئەی تۆ نازانی كە خوا حەرامی كردوە؟ جاكابرا روی كردە خزمەتكارەكەی‌و وتی: بڕۆ بیفرۆشە، پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: ئەی باوكی فلانە كەس چ

دەستورێکت پێدا؟ وتی: دەستورم پێدا کە بچێت بیفرۆشێت پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەو کەسەی کە خواردنەوەکەی حەرام کردوە فرۆشتنەکەشی هەر حەرام کردوە، ئینجا فەرمانی پێداو لە ناو بەردەڵانەکانی مەدینەدا رژێنرا}، ئیمامی بوخاریو موسلم دەگێرنەوە کە عومەری کوڕی خەتاب لە میمبەری پێغەمبەری خواﷺ لە خوتبەیەکیدا وتی: ئەی خەڵکینە ئایەتی حەرامکردنی شەراب دابەزیو ئەو کاتە شەراب لەم پێنج شتە دروست دەکرا لە ترێو لە خورماو لە هەنگوینو لە گەنمو لە جۆو. شەراب ﴿ا مر﴾ ناوە بۆ هەر شتێك کە عەقڵ داپۆشێتو کابرا بێ ئاگاو مەست بکات، سەعد دەڵێ: چوار ئایەت سەبارەت بە شەراب دابەزیوە ئینجا پاش باسکردنی ئەو چوار ئایەتە دەڵێ: پیاوێکی یاریدەدەر خواردنێکی دروستکردو بانگی کردینو پاش خواردن شەرابمان خواردەوە پێش ئەوەی کە حەرام بکرێت هەتا سەر خۆش بوین ئینجا دەستمان کرد بە خۆهەڵکێشان یاریدەدەرەکان وتیان: ئێمە بەرێزین وکوچەریەکانیش وتیان: ئێمە بەرێزینو پیاوێکی یاریدەدەرەکان ئێسقانی چەناکەی وشترێکی بەر دەست کەوتو دای لە لوتی سەعدو کونی کرد ئیتر ئەم ئایەتە دابەزی﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ - الى - فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ؟﴾ ئینجا کاتێ ئایەتی حەرامکردنی شەرابو قومار دابەزیو بەپیسی ناوبران داخ لە دڵانی منافقو بێ باوەڕ ئەمەیان وەك هەڵێ قۆستەوەو دەستیان دایە بڵاو کردنەوەی پرو پاگەندە بۆ لەکەدار کردنی ئایینو دروستکردنی دڵەڕاوکێ لە ناو موسڵمانان داو وتیان: ئەگەر ئەمە پیسە خۆ هەندێ لە موسڵمانان لە مەو بەر مردون یان شەهید بوون سکیان پڕ بوە لەو پیسەیەو دەبێ ئەوانە وەزعیان چۆن بێت؟ خوای داناو میهرەبانیش دەمکوتی کردنو فەرموی :

(٩٣) هیچ تاوانێك نیە لە سەر ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە لە سەر ئەوەی کە لەو شتە پیسەیان خواردوە لە پێش قەدەغە کردنیدا مادام تەقوایان هەبوبێتو لە خوا ترسا بنو باوەڕیان هێنا بێتو کرداری چاکیان کردبێت لە پاشان لە خوا ترسا بنو باوەڕیان هێنابێ لە پاشان لە خوا ترسا بنو چاکەیان کردبێ ، وە بەراستی خوا چاکە کارانی خۆش دەوێت. بەڵێ ئاوەها خوای میهرەبانو دانا دەمکوتی موناففقانو کافرانو هەڵپەرستان دەکاتو دڵخۆشی کەسو کاری مردو شەهیدەکانیش دەکات کە ئەمەش رەحمی خوایە بەرامبەر بە موسڵمانان ، واتە: ئەگەر هاتو کەسێك بە نەزانی گوناهێکی کرد هەر کاتێك زانیو وازی لێ هێناﷲ تۆڵەی لێ ناسێنێت، ئینجا باسی یاسایەکی ترمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٩٤) ئەی باوەڕداران خوا تاقیتان دەکاتەوە بە شتێك لە بارەی نێچیرەکانەوە ئەو نێچیرانەی کە دەستتانو سەرە ڕمەکانتان پێیان دەگات، چونکە بچوکن یان لاوازن تاکو خوا دەری خا بۆ خەڵك کە کێ لە پەنامەکی دا لە خوا دەترسێت وکێیش لێی ناترسێت. چونکە خوا خۆی دەزانێت کێ دەترسێتو کێ ناترسێت لێی بەڵکو بەم شێوەیە ئەو زانینەی خۆی ئاشکرا دەکات جا هەر کەسێك دەستدرێژی بکات دوای ئەوەی کە ئەو حوکمەی بۆ هاتو نێچیری قەدەغە کراو راو بکات ئیتر بۆ ئەو هەیە سزایەکی دەردناك ئەمە بۆ ئەو کەسانەیە کە دەچن بۆ حەجو دەگەنە کەعبەو لە ئیحرامی حەج یان عومرەدان هەروەها ئیشارەیەکی ترە بۆ هەمو راوکەرێك ، چونکە زۆر جار راوچی هەر حەیوانێکی بۆ دەربکەوێت راوی دەکات ئیتر نازانێت ئایا دەستی دەکەوێت یان نە؟ یان لە حەیوان دەدات بەڵام لە بەر کەژ نەزڕان یان هەر هۆیەکی تر ناچێت سەری ببڕێو مردار دەبێتەوەو کاتێ هەستا دەیهێنێو دەیخوات کە ئەمە حەرامەو نابێ بخورێت، ئینجا خوا جەزای ئەو نێچیرانەی هەردوو حەرەم (مەکەومەدینە) باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٩٥) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە نێچیر نەکوژن لە کاتێکدا کە ئیحرامی حەجتان بەستوەو هەر کەسێك لە ئێوە حەیوانێکی حەرەم بە دەستی ئەنقەست بکوژێت ئەوسا ئەوە دەبێ تۆڵەی بداتەوە بە حەیوانێکی وێنەی خۆی لە حەیواناتی ماڵی بۆ نمونە کابرا گایەکی کێوی کوشت دەبێ گایەکی ماڵی بدات لە تۆڵەی دا، جا هەر کاتێ حەیوانێکی کوشت، ئەگەر وێنەی ئەو حەیوانە بو لە ناو حەیوانی خۆماندا دەبێ بیکرێتو بیدات لە تۆڵەی ئەو حەیوانەدا کە دوو مرۆڤی دادپەروەر لە خۆتان حوکمی پێ دەکات چ لەو حەیوانانەی کە وێنەیان هەبێ یان نرخی ئەو نێچیرە لەو حەیوانانەی کە وێنەیان نەبێت ئەوەش دەبێ بگاتە کەعبەو لەو شوێنەی کە حەیوانی تێدا سەر دەبڕێت لەوێدا سەر ببڕێتو گۆشتەکەی دابەشکرێت خۆ ئەگەر دەسەڵاتی نەبو حەیوانەکە بکڕێت یان حەیوانەکە وێنەی نەبو ئەوە تۆڵەکەی خواردنی چەند هەژارێکەو دەبێ بدرێت یان لە جیاتی ئەو خواردنە رۆژوو بگرێت بۆ مەنێك رۆژێك هەتا ئەوکابرایە تۆڵەی ئەو ئیشە خراپەی خۆی بچەژێت ﷲ خۆش دەبێت لەوەی کەلەپێشدا کراوەو دوای ئەوە هەر کەسێك دژایەتی ئەم حوکمەی کرد خوا تۆڵەی لێ وەردەگرێت بەو شێوەی کە لە پێشەوە باسکرا ئەگەر تۆبەش نەکات لە رۆژی دوایدا دوچاری سزا دەبێتو ﷲ زۆر زۆر بە هێزەو خاوەنی تۆڵە سەندنەوەیەو کەس ناتوانێ لە دەستی دەربچێت. ئینجا بۆ ئەوەی بزانین کە ئایا هەمو نێچیرێك لە سەر

ئەو کەسەی کە لە ئیحرامدایە قەدەغەیە یان جیاوازیان هەیە دەفەرموێ:

(٩٦) حەڵاڵ کراوە بۆتان نێچیرەکانی دەریاو خواردەمەنیەکانی ئەوەی کە ئاوەکە خۆی بیداتە لا مادام بۆنی نەکرتبێت کە لەزەتێکە بۆ ئێوەو بۆ کاروانچیان ، واتە: ئەگەر کەسێك لە ئیحرامی حەج دابێتو ماسی بگرێت تاوان نیەو حەڵاڵە بۆی، وە حەرامە لە سەر ئێوە نێچیری دەرەوەی ئاو مادام لە ئیحرام دابن، وە بترسن لەو خوایەی کە ئێوە دەگەڕێنرێنەوە بۆ لای و حیسابتان لە گەڵدا دەکات. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: حەرامە نێچیر بۆ ئەو کەسەی کە لەئیحرامدایە چ خۆی بیگرێ یان بۆی بگرن،واتە: ئەگەر کابرایەك کە لە ئیحرامی حەجدا نەبو چوو حەیوانێك ڕاو بکات بۆ کابرایەك کە لە ئیحرام دا بو ئەوە حەڵاڵ نیەو نابێ کابرای حاجی لەو گۆشتە بخوات چونکە بۆ ئەو راوکراوە، بەڵام دروستە لە حەجدا شتی زیاندەر بکوژرێت وەکو مارو دووپشكومشكو قەلەڕەشەو سەگی هار.

(٩٧) خوای گەورە کەعبەی داناوە کە ماڵێکی بەرێزوقەدەغە کراوە کەببێت بەهۆی راپەڕاندنی بژێوی خەڵكو رێكوپێکی کارو باریان بۆ ئەوەی کە مەردوم هاتو چۆ بکەنو بژێوی خۆیان بە دەست بهێننو ژیانی عائیلەی خۆیان دابین بکەن مانگە حەرامەکانو ئەو هەدیەی کە دەبرێ بۆ ئەو ماڵەو ئەو گەردن بەنانەی کە دەبنە هۆی پاراستنی حەیوانەکەو خاوەنەکەی لە دەست درێژی، هەمویان مایەی چاکتر کردنو بە هێزتر کردنی خەڵکی موسڵمانن بە گشتیو خەڵکی عەرەبن بە تایبەت ئەوەتە وڵاتێکی بێ دەرامەدو ڕەقو وشك بە هۆی ئەوانەوە خودا ئاوەدانی کردەوەو خەیرو بەرەکەتێکی زۆری وای رژاند بە سەریاندا ئەمڕۆ ئەوان لە تەواوی موسڵمانانی جیهان خاوەن سەروەتو سامانترن، دەی ئەوە دەبێ ببێت بە هۆی بیرو باوەڕی راستو دروست بۆ هەمو مرۆڤێکی ژیر کەبیر بکاتەوەو بە چاکی دەسەڵاتو هێزو زاناییو توانایی خوای خۆی بناسێت هەروەك لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ئەوەبۆ ئەوەیە کەئێوە بزانن کە بەبێگومان ﷲ ئەوەی کەلە ناو ئاسماناندایەو ئەوەی لە ناو زەویدایە دەیزانێت، ئەوەتا لە ئاسمانەوە بڕیار دەدات کە دەبێ مرۆڤ ئاگای لە مانگی حەرام بێتوئاگای لەو هەدیەو گەردن بەن لە ملانەدا بێتو دەست درێژیان بۆ نەکەنو وا نەزانن کە بێ خاوەننو ئاگاتان لێیان بێت چونکە بە بێگومان کە ﷲ بە هەمو شتێك زانایەو هیچ شتێك لە زانیاری ئەو دەرناچێت. هەروەها بۆ ئەو کەسەی کە لەوێیە بیر لە زەمزەمو کەعبەو شوێنەوارەکان بکاتەوەو لەخەوی بێ ئاگاییو دنیا پەرستی رزگاربببێتو ببێت

أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ (٩٦) ۞ جَعَلَ اللَّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ قِيَامًا لِّلنَّاسِ وَالشَّهْرَ الْحَرَامَ وَالْهَدْيَ وَالْقَلَائِدَ ۚ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَأَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٩٧) اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٩٨) مَّا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ (٩٩) قُل لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ ۚ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ (١٠٠) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْأَلُوا عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ الْقُرْآنُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا اللَّهُ عَنْهَا ۗ وَاللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ (١٠١) قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُوا بِهَا كَافِرِينَ (١٠٢) مَا جَعَلَ اللَّهُ مِن بَحِيرَةٍ وَلَا سَائِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ۙ وَلَٰكِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ ۖ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ (١٠٣)

بەجێگای ڕاپەڕینی خواناسان دژی نەفس پەرستیو دنیاویستی ، ﷲ ئەو جێگایەی وا دروستکردوە کە هەر کەسێك بچێتە ئەوێو بە چاوی سەرودڵی ببینێت یەکسەر لە دەرونەوە رادەپەڕێت، جا بۆ سودی زیاتر دەڵێین: کاتێ کە ئیبراهیم(علیەالسلام) تەشریفی هێنایە میسرو پاشای میسر زوڵمی لێ کردو سارا خاتونی لێ داگیر کرد ، بەڵام کاتێ کە ویستی تەعەدای لێ بکات سارا خاتون زۆر روی خۆی لێ گرژ کردو ئەویش پشتی تێ کردو گوێی پێ نەداو چووە سەر جێگای خۆیو خەوت کە خەوی لێ کەوت لە خەودا پێیان وت: خێزانی ئەو کابرایە دەبێ تەسلیم بکەیتەوە ئەویش هەر لە خەو هەڵسا وتی: ئەم ئافرەتە ببەنەوە بۆ کابرای مێردی ئەمە چیە بۆ منتان هێناوەو ئافرەتێکی بە ناوی هاجەرەوە پێ بەخشیو وتی: من ئەم چەند سەعاتە ئازاری روحی تۆم داوە ئەم ئافرەتەش بۆ تۆ هەدیە بێت تاکو خزمەتت بکات ئیبراهیم تا ئەو کاتە لەو خێزانەی کە ئامۆزای بو هیچ منداڵی نەبو تەمەنیشی زیاتر لە نەوەد ساڵ بو، جاپاش ماوەیەك سارە خاتونی خێزانی داوای لە ئیبراهیم کرد کە ئەم ئافرەتە من دەی بە خشم بە تۆو تۆ نیکاحی بکە لە خۆت بەڵکو منداڵێکمان بۆپەیداببێت بۆ هەردووکمان باشە ئیبراهیم لە سەرەتاوە پێی وت: ئەمە شتێکی چاك نیە لە دوایدا دەبێت بە هۆی نارەحەتی لە نێوانمان دا ئەویش زۆری لێ کرد کە ئەم ئیشە بکات دیارە ﷲ ئیرادەی وا بوەو وەحی کردە لای ئیبراهیم کە بە گوێ خێزانەکەی بکات ، ئینجا ئەو ئافرەتەی مارە کردو پاشان حامیلە بو هەر لە تەك

ئاشكرابونی حەملەكەیدا سارا خاتون نارەحەت بوو لە گەلیو تاكو منداڵەكە بو، هەر كە منداڵەكە پەیدا بو وتی: نابێ بە هیچ شێوەیەك ئەو ئافرەتەو ئەو منداڵە لە شوێنێك بن كە من گوێم لە دەنگی ئەوان بێت، ئینجا ﷲ وەحی كردە لای ئیبراهیمەو فەرموی: بیبەو دوری بخەرەوە ئینجا ئیبراهیم هاجەرە خاتونو منداڵەكەی لە گەل هەندێك خۆراك كە لە توانای دا بوبێت لە گەل خۆی بردیو لە میسرەوە چوون بۆ ئەو شوێنە چۆڵاییەی كە هیچ كەسێكی تێدا نەبو لە پاش دانانیان خۆی گەڕایەوە، كاتی گەڕانەوەی خێزانەكەی پێی وت: ئەی ئیبراهیم چی دەكەیت؟ ئینجا ئیبراهیم گوێی پێ نەداو گەڕایەوە لە پاشان هاواری كردو وتی: تۆ ئەگەر بەزەیت بە من دا نایەتەوە ئایا بەزەیت بە منداڵەكەی خۆتا نایەتەوە؟ ئیبراهیم هەرسور بو لەسەر ڕۆیشتن لە دواییدا ئافرەتەكە باوەشی كرد بە لاقی ئیبراهیم دا بۆ ئەوەی كە نەڕوات دەڵێن: ئیبراهیم هەر ڕۆیشت لە پاشان وتی: ئەی ئیبراهیم ئەمە تۆ خۆت بڕیارت داوە كەبڕۆی یان ﷲ وای فەرموە كە وام پێ بكەیت؟ ئینجا ئیبراهیم پێی وت: ﷲ دەفەرموێ. جا ئیتر هاجەرە خاتون دەستی بەردا لە لاقیو وتی: بڕۆ مادام ﷲ ئەمری بە تۆ كردوە بێشك ئاگای لە منیش دەبێتو زایەمان ناكات بەڵێ ئیبراهیم ڕۆیشت جا هەندێك جار بە توندی دەڕۆیشتو جار جاریش بە هێواشی لە دوای دا كە پرسیاریان لێ كرد وتی: كاتێ بیری ئەو منالەو دایكەكەیم دەكردەوە هێزم نەبو بچم بە ڕێدا، بەڵام كاتێ كە ئەكەوتمەوە بیری ئەوە كە فەرمانی ﷲ یە بە توندی دەڕۆیشتم نەوەك ﷲ لێم عاجز ببێتو غەزەبم لێ بگرێت، ئینجا با لێرەدا ئیبراهیم بە جێ بهێڵین بەڵێ ئەم ژنو منداڵە لەوێ بە جێ مانو خواردنەوە تەواو بوو خۆراك نەما لە پاش ماوەیەك كە هیچ شتیان لا نەما منداڵەكە دەستی كرد بە گریان لە بەر برسیەتیو دایكیشی هیچی نەبو بیداتێ هەتا دەڵێن: دەگریا بە سەری دا بەڵكو فرمێسكی چاوی بێتە خوارەو بكەوێتە دەمی منداڵەكەوە بۆ ئەوەی لە تینوی ڕزگاری بكات ، بەڵام دوای چەند ڕۆژێك فرمێسكیش نەماو منالێ هەر دەگریا لە برسیاو لە تینواو دایكی لە حەیوەتی منالێ لە لایەكو برسێتی خۆی لە لایەكی ترەوە وەقرەی نەدەگرتو نەیدەزانی چی بكاتو چاوی لە هەمو لایەك دەكرد تا بەڵكو جێگایەك یان كەسێكی چاو پێ بكەوێتو داوای فریاكەوتنی لێ بكات زۆری نوارێ، بەڵام بێجگە لەدوو تەپۆڵكەی بچوك هیچی بە دی نەكرد ناچار بە پەلە چوە سەر تەپۆڵكەی یەكەمیان كە ناوی سەفا بو زۆر تەماشای ئەم لاو ئەو لای كرد هیچی نەدی تەنها ئەوە نەبێت كە لە سەر تەپۆڵكەكەی تر شتێكی دی وەكو ئاو وابو كە پێی دەوترێت سەراب لە ناوچەكانی عەرەبستان لە كاتی گەرمادا لەدەشتاییەكاندا هەیە كە لە دورەوە وەكو ئاو وایە، بەڵام كە لێی نزیك بویتەوە هیچ نیە، ئینجا لە نێوانی ئەو دوو تەپۆڵكەیەدا حەوت جار هاتو چۆی كرد كە لە جاری ئاخردا دەنگێكی بەر گوێ كەوتو خۆی بە خۆی وت: بێ دەنگ بە ، ئینجا لە بەر خۆیەوە وتی: ئەگەر چاكەت لایە فریام بكەوە ئینجا دی زەلامێك لای منداڵەكەیەو دی كەئیشارەتی بۆ دەكات كە بێتەوە لای منداڵەكەی دوای ئەوەی كە لە هەمو شت نائۆمێد بو كاتێ هات زەلامەكە ڕۆیو چاڵێكی بچوكی لە خواری لاقی منالەكەوە كردبو تەڕاییەكی تێدابوو ئەویش بە پەلە دەستی بردو هەندێكی لێ هەڵكەندو ئاو هەڵقوڵاو هاجەرە خاتون ئەم لاو ئەو لای دەگرتو ئاوی بە دەستی دەردەهێناو دەی خواردەوەو بە منالەكەشی دەدا وكوندەكەی لێ پڕ كرد. ئیبنو عەباس دەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرموی: {یَرْحَمُ اللهُ أم إِسْمَاعِيلَ لَوْ تَرَكَتْ زَمْزَمَ أَوْ قَالَ لَوْ لَمْ تَغْرِفْ مِنْ الْمَاءِ لَكَانَتْ عَيْنًا مَعِينًا وَأَقْبَلَ جُرْهُمُ فَقَالُوا أَتأذَنِينَ أَنْ نَنْزِلَ عِنْدَكِ قَالَتْ نَعَمْ وَلَا حَق لَكُمْ فِي الْمَاءِ قَالُوا نَعَمْ/رواه البخارى وغ ه/ ڕەحمەتی خوا لە دایكی اسماعیل بێت ئەگەر وازی لێ بهێنایە یان فە رموی: ئەگەر ئاوی لێ هەڵنەگۆزایە زەمزەم ئەبو بە چاوگەیەك وبۆهەمیشە ئاوی لە بەر دەڕۆیی} بەڵێ بە ڕاستی هەر كەسێك خوا سەرپەرستی بكات لە ناو ناچێت، ئەو كاتە جێگای بەیت شوێنیكی كەمێ بەرز بو لافاو دەهات لەم لاو لەولا ی دەبردو لە شوێنی ئەودا درەختێك بو كە كاتی خۆی ئیبراهیم ئەوانی لە ژێر ئەو درەختەدا دانا بو جا هەر بەم شێوەیە مانەوە تا كۆمەڵێك خەڵكی (جورهوم) لە خواروی مەكەوە دابەزینو چاویان بە هاتوچۆیەكی زۆری باڵندە كەوت وتیان: ئەو باڵندانە بە دەوری ئاوا دەسوڕێنەوەو ئێمە تا ئێستا لەو شیوەدا ئاومان نەدیوە لە بەر ئەوە یەكێ یان دوانیان نارد بەرەو ئەو جێگایەی كە باڵندەكان تێیدا دەخولانەوە دییان ئەوە ئافرەتێكەو منداڵێكی لە گەل دایەو كانی ئاوێكیان لە لایەو چوونەوەو هەواڵەكەیان بەو كۆمەڵە خەڵكەدا وئەوانیش هاتنو كاتێ ئەو ئافرەتو منداڵەیان دی داوایان لە ئافرەتەكە كرد كە ڕێگایان بدات ئەوانیش ماڵی خۆیان بهێننە ئەو شوێنەو ئافرەتەكەش گفتی پێدان بەو مەرجەی ئاوەكە هەر لە دەستی خۆیدا بێت ئا بەم شێوەیە مەكەی ئێستا ئاوەدان كرایەوەو پاش ژنی دووهەمی ئیسماعیل لەو خێڵە ئیبراهیمی باوكی هات بۆ لایو بە یەك شاد بونەوەو وتی: دەمەوێ لەو شوێنە بەرزەدا ماڵێك دروست بكەمو ئیسماعیلیش بەڵێنی یارمەتی دانی دایەو دەستیان كرد بە دروستكردنیو ئیبراهیم وەستایەتی دەكردو ئیسماعیلیش بەر دەستی باوكی دەكرد تا دیواریان بەرز كردەوەو چوون بەردێكی گەورەیان هێنا تا ئیبراهیم لە سەری بوەستێتو باش دەستی بگاتە سەر

دیوارەکەو خانویان تەواو کردو جێگای پێی ئیبراهیم لە سەر ئەو بەردە کەوت دەڵێن: هەتا سەردەمی پێغەمبەرمانﷺ هەر دیار بو، جا ئەو کەسەی کە بچێ بۆ حەجو بیر لە پەیدا بوونی زەمزەمو سەفاو مەروەو کەعبە بکاتەوەو بزانێ چۆن پەیدا بوونو چی کراوە لەو شوێنە داو چۆن خوای داناو ئاگا یارمەتی ئەو منداڵو ئافرەتەی داو لەو بارودۆخەوە کردنی بە هۆی ئەو ئاوەدانیە گەورەیە کە هەتا رۆژی قیامەت ساڵانە دەیان ملیون کەس سەر لەو جێگاو بارەگا پیرۆزانە دەدات بێگومان باکی لە هیچ نابێو بێ ترس دەست بە ئایینی خۆیەوە دەگرێتو لە هیچ کۆسپێك سڵ ناکاتو مانای راستەقینەی ئایەتەکەی بۆ دەردەکەوێت کە بەراستی ژیانی راستەقینەی مرۆڤ بریتیە لە خوا پەرەستی کە بە ئەو سەفەرە بە نرخە بە هێزترو خاوێنتر دەبێتەوە بەو مەرجەی بزانێ بۆچی دەچێت بۆ ئەو ماڵە پیرۆزە. کەوابو پێویستە مرۆڤ خۆی بپارێزێت لە تاوانو خراپەکاری چونکە خوا ئاگای لێیەتیو تۆڵەی سەختی هەیە بۆ تاوانبارانو خراپە کاران وەك دەفەرموێ:

(٩٨) بزانن بێگومان ﷲ زۆر بە هێزو توندە تۆڵەکانی بۆ تاوانبارانو بێگومان ﷲ زۆر لێبوردەو بە بەزەییە سەبارەت بە بەندەکانی. جا پێویستە موسڵمانان زۆر ترسیان هەبێ لە خواو نائۆمێدیش نەبن لە چاو پۆشیو لێخۆشبونی، واتە: نابێ لە خۆیان بایی ببنو نابێ نائۆمێدیش ببن ئینجا دەفەرموێ:

(٩٩) ئەم پێغەمبەرەﷺ تەنها تەبلیغو گەیاندنی ئەوپەیامەی لە سەرە، وە ﷲ دەزانێ بەوەی کە ئاشکرای دەکەنو ئەوەی کە دەیشارنەوەو هیچی لێ ون نابێ ، جا نە چاکە کاران بترسن بۆ لە ناو چوونو کەم بونەوەی چاکەکانیانو نە ستەمکاران دڵخۆشبن لە ستەمەکانیان چونکە خوا بە وردو درسی ئیشەکانیان ئاگادارە.

(١٠٠) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: هەرگیز پیسو پاك وەكو یەك نین، واتە: باوەڕداران پاكو خاوێنن هەرچەند بە ژمارە کەم بنو بە رواڵەت لاوازو بێ دەسەڵات بن هەر ئەوان چاکن ، چونکە پاکن بەڵام بێ باوەڕان پیسن هەر چەند لە ژمارەدا زۆر بنو بە رواڵەت بە هێزو بەدەسەڵات بن کەواتە وەکو یەك نین ئەگەر چی لە زۆری پیسەکە سەرت سوڕ بمێنێت، خوا پاکەو بێجگە لە پاکی ناوێ، دەی لە خوا بترسن ئەی خاوەن عەقڵەکان بەڵکو رزگار ببن. ئینجا ﷲ تەمیەی خاوەن باوەڕان دەکاتو دەفەرموێ:

(١٠١) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە پرسیارلەبارەی شتانێك مەکەن کەئەگەر ئاشکرا بکرێت بۆتان خەمبارتان بکاتو پێتان ناخۆش بێت ، وە ئەگەر پرسیار لەو شتانە لە کاتێکدا بکەن کە قورئان دادەبەزێت بۆتان ئاشکرا دەکرێ بەڵام ﷲ چاوپۆشی کردوە لەو شتانەو ئێوەش هەوڵ نەدەن بۆ ئەوەی باس بکرێت بۆتان ، وە ﷲ لێبوردەو زۆر بە حەوسەڵەیە.، ئەبو هورەیرە دەڵێت :پێغەمبەری خوا ﷺ رۆژێك هاتە دەرەوە کە تورە بو دەمو چاوی سور هەڵگەڕا بو هەتا چووە سەر مینبەرو پیاوێك وتی: باوکم لە کوێیە؟ فەرموی: { النار/ لە ناو ئاگردایە} یەکێکی تر وتی: کێ باوکمە؟ فەرموی:{أبوك حذافة/ باوکی تۆ حوزافەیە} ئیتر عومەری کوڕی خەتتاب هەستاو وتی: رازین کە ﷲ پەروەردگارمانەو ئیسلام ئاینمانەو محمدﷺ پێغەمبەرمانەو قورئان پێشەوامانەو ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە زۆر نیە لە نەزانیو شیرك وازمان هێناوەو خوا دەزانێ کێ باوکامانە ، ئیتر پێغەمبەرﷺ رقچونەکەی نەماو ئەم ئایەتە دابەزی ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ... ﴾ عەلی دەڵێ کاتێ ئایەتی﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ مَنِ ٱسۡتَطَاعَ إِلَيۡهِ سَبِيلٗاۚ / پێویستە لەسەرخەڵك مادام توانای رێگای هەبێت کە حەج بکات﴾ دابەزی وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ هەمو ساڵێك؟ بێ دەنگ بو هەم وتیان: هەمو ساڵێك؟ فەرموی: {لا ولو قلت نعم لوجبت فأنزل الله ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴾ /رواه الترمذی وصححه الألبا / نەخەیر، خۆ ئە گەر من بم وتایە بەڵێ واجب دەبوو ئینجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴾

لێرەدا وشەی غەفوری بە کار هێناوە تا ئەگەر کابرا تاوانێکی کرد نائۆمێد نەبێ چونکە ﷲ بە سۆزەو لێ خۆشبوە وە سیفەتی حەلیمی بە کار هێناوە واتە بە حەوسەڵەیەو پەلە ناکات لە تۆڵە سەندنەوەدا ئێوەش هەروا لە سەر خۆتان بنو ورد ببنەوە لە قسەکانتانو قسەو پرسیاری بێ جێو بێ سود نەکەنو پرسیاری بێ سودیشتان لێ کرا لە سەر خۆو بە حەوسەڵە بن، بەڵێ ئەگەر چی تازە ئەحکام ناگۆڕێو قورئان دانابەزێ، بەڵام پێویستە موسڵمانان لە پرسیار کردنی بێ سوود خۆیان بپارێزنو باسی نەکەن. ئینجا دەفەرموێ:

(١٠٢) بە راستی گەلێك لە پێش ئێوەدا پرسیاریان کرد لە پاشان بێ باوەڕ بوون پێی. بەڵێ لە هەر سەردەمێکدا کە داوای شتیان کرد بێتو خوا بۆی ئەنجام دابنو لە پاشان هەر لە سەر رەوشتی خراپو بێ باوەڕی خۆیان چوبن خوا تۆڵەی لێ وەرگرتونو سزای داون جا هەر گەلێك بە جۆرێك یەکێ بە بارانو یەکێ بە باوو

یەکێ بە خنکاندن. ئینجا نەریتێکی تری نەفامەکان هەڵدەوەشێنێتەوەو دەفەرموێ:

(١٠٣) خوا بەحیرەو سائیبەو وەسیلەو حامی دانەنابووئەمانە خۆیان دایان نابون، نەدەبو کەس لەوانەسود وەربگرێت کە ئەمە قسەیەکی درۆ بو بە دەمی خوداوە دەیانکردو زۆربەی ئەوان نافامن. عائیشە (رەزای خوای لێ بێت) دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویی: {رَأَيْتُ جَهَنَّمَ يَحْطِمُ بَعْضُهَا بَعْضًا وَرَأَيْتُ عَمْرًا يَجُرُّ قُصْبَهُ وَهُوَ أَوَّلُ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ/ تفرد به البخاری/ چاوم بە جەهەنەم کەوت کە هەندێکی هەندێکی دەهاڕیو چاوم بە عەمر کەوت کە ریخۆڵەکانی خۆی دەکێشا بە شوێن خۆیدا ، وە ئەو یەکەم کەس بو کە (سائبة) ی واتە نەزری بۆ بت داهێنا عەمری کوڕی لوحەیی کوڕی قەمەعە یەکێك بو لە سەرۆکەکانی تیرەی خوزاعە ئەوانەی کە پاش جورهومیەکان بوون بە سەرپەرشتی (بەیت)و ئەو یەکەم کەس بو کە ئایینی ئیبراهیمی گۆڕیو بتی هێنایە حیجازو داوای لە خەڵکی سادە لەوح کرد کە بیان پەرستن‌و یاسایەکی نەفامی بۆ دانان سەبارەت بە حەیواناتو بێجگە لە حەیوانات. وەك خوای داناو ئاگا لە سورەتی (الانعام) لە ئایەتی ١٣٦_١٣٩/ باسی دەکات. ( ة) ئەو وشترەیە کەئەگەر پێنج سکی بکردایەو سکی پێنجەمیان نێر بوایە سەریان دەبڕیو پیاوو ژن لێی دەخوارد بەڵام ئەگەر مێ بوایە گوێیان ئەبڕیو ئەیان وت: ئەمە بەحیرەیە (السائبة) موجاهد دەڵێ(سائبة) لە مەڕە هەروەکو بەحیرە بەو جیاوازیەی کە ئەگەر تا شەش سك یەك جۆر بوایە نێر یان مێ حەوتەمیان ئەگەر نێر بوایە یەکێ یان دوان بوایە سەریان دەبڕیو تەنها پیاوان ئەیانخواردو بەشی ئافرەتانیان لێ نەدەدا

٢ـ محمدی کوری اسحاق دەڵێ: سائیبە بە وشترێ دەڵێن کە دە سکی مێی بکردایەو نێریان لە بەینا نەهاتایە ئەمە ئیتر سائبە بو نەدەبو کەس سواری ببێت یان کورکەکەی ببڕێ یان شیرەکەی بدۆشێ.

٣ ـ دەڵێن: ئەگەر پیاوێك بچوایە بۆ ئیشێك‌و بۆی جێبەجێ بکرایە وشترێك یان حەیوانێکی تری دەکرد بە (سائبة)و دای دەنا بۆ بتەکان‌و هەرچی ببوایە دەبوایە لەو بتانە دا خەرج بکرایە

٤ـ سوددیی دەڵێ: ئەگەر پیاوێك پێویستیەکی بۆ جێ بە جێ بکرایە یان لە نەخۆشیەك چاك بوایەوە یان ماڵی زۆر بوایە شتێکی لەو ماڵە دادەنا بۆ بتەکان‌و هەر کەسێ دەست درێژی بۆ بکردایە تۆڵەی سەختی لێ دەسەنرایەوە لە دنیادا.

(الوصیلة) ئیبنو عەباس دەڵێ: بریتیە لەوەی کە ئەگەر حەیوانێك حەوت سکی بکردایە تەماشای سکی حەوتەمیان دەکرد ، جا نێر بوایە یان مێ ئەگەر مردو بوایە هەر بۆ پیاو بو نەیان دەدا بە ئافرەت، وە ئەگەر مێ بوایە وازیان لێ دەهێناو ئەگەر نێرو مێ بوایە بە یەك سك دیسان وازیان لێ دەهێناو دەیان وت:خوشکەکەی پێی گەیشتوەو حەرامی کردوە لە ئێمە. سەعیدی کوری موسەیب دەڵێ: (وصیلة) لە وشتر بو ئەگەر یەکەم سکی مێ بوایە وە سکی دوهەمی هەر مێ بوایە دەیان وت: دوو مێی لکاند بە یەکەوەو نێریان لە بەینا نەبوە، دەهاتن گوێیان دەبڕیو بەرەڵایان دەکرد بۆ بتەکانیان. محمدی کوڕی ئیسحاق دەڵێ: لە مەڕ بو ئەگەر بە پێنج سك دە مێی ببوایە بە جوتە ناویان دەبرد بە (وصیلة) و وازی لێ دەهێنرا پاش ئەوە هەرچی ببوایە چ نێر چ مێ هی پیاوان بوو ئافرەت بێ بەش بون لێی، وە ئەگەر بمردایە هەردوو هاوبەش دەبوون تێیدا. (حام ) عەوفی دەڵێ: ئیبنو عەباس وتی: ئەگەر نێرێك دە جار بپەڕیایە پێی دەوترا (حام)و وازی لێ دەهێنرا. عەلی کوڕی ئەبی تەلحە لە ئیبنوعەباسەوە دەڵێ: (حام ) لە وشترەوە وەختێ کە بەچکەی بەچکەیی هەبوایە دەیان وت: ئەمە ئیتر پشتی خۆی پاراستوەو نابێ شتی لێ بار بکرێت‌و نابێ کورکەکەی ببڕن‌و نابێ لە هیچ لەوەڕگایەك دەربکرێت، وە نابێ لە هیچ ئاوێك بەرگری بکرێت ئەگەر چی هی خاوەنەکەیشی نەبوایە، ئەمەی باسکرا مانای ئەو چوار وشە بو، وە مانای تری کراوە کورتەی قسە ئەوەیە کە هەر جۆرە بڕیارو یاسا دانانێك مادام بڕیاری خواو پێغەمبەریﷺ لە سەر نەبێت حەرامەو تاوانەو پێویستە خاوەن باوەڕان خۆیان لێ دوور بخەنەوە بەڵکو دەبێ دژایەتیشی بکەن، چونکە هەر جۆرە یاسا دانانێك دژایەتی خوایەو کوفرە مادام ئەو یاسایە لە قورئان‌و حەدیسدا دەرنەهێنرابێت ئەمانەی ئێرە چەند شتێکی تایبەتین لەو مانا گشتیەی کە لە پێشەوە فەرموی ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ﴾ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ﴾ المائدة: ٤٤،٤٥، ٤٧ وە ئایەتی ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ الأعراف: ٥٤ وە چەندین ئایەتی تر کەخوای خاوەن دەسەڵات وزانا ئەو بت پەرستانە بە درۆ دەخاتەوەو یاساکانیان هەڵدەوەشێنێتەوەو دەفەرموێ: کە ئەوانە درۆزن‌و کەڵەك چین‌و کەس مافی ئەوەی نیە کە ئاوا بڕیارێك بداتو بڕیار دەران بە کافر دائەنێت‌و دەفەرموێ: جا بەراستی ئەوانەی کە کافرن درۆ بە دەمی خواوە هەڵدەبەستن‌و زۆربەی ئەو کافرانە بێ عەقڵ‌و نەزانن :

(١٠٤) هەر کاتێك پێیان بوترێت وەرن بۆ لای ئەوەی کە خوا ڕەوانەی کردوە، وە بۆ لای پێغەمبەر ﷺو بە گوێی بکەن دەڵێن: بەسمانە ئەوەی کە باب و باپیرانمان کردویانەو ئێمەش هەر ئاوا دەکەین ﷲ دەفەرموێ: ئایا هەر بە گوێی باوکانیان دەکەن ئەگەر چی باوکانیان هیچیان نەزانی بێتو ڕێگای حەقیان نەدیبێتەوە؟ هەروەك ئێستای خۆمان کاتی خۆی مەلا کەم بوە لە (١٠) گوندا مەلایەك هەبوە ئینجا ئەو مەلایەش ئەگەر گەڕابێت یان شتێکی کەمی پرسیار لێ کرابێت واتە شتی ئایینی بە زۆری نەزانراوەو زۆر شتی داهاتویش هاتوەتە ناو خەڵکەوە بە ناوی ئاینەوەو ڕەواجی پەیدا کردوەو کەسێکی واش نەبوە بە سەر هەمو شتەکاندا گەیبێتو بۆ خەڵکی ڕوون کردبێتەوە، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئێستا زانیاری ئایینی بە چاکی بڵاو بوەتەوەو زانای باش پەیدا بوە هەتا وای لێ هاتوە نەك هەر گوندێك بەڵکو هەر بنەماڵەیەك بەڵکو هەر ماڵێك نەفەرێکی زانای تێدایە کە لە دینی خوا شارەزا بێت، خۆ ئەگەر کابرا ئارەزۆی ئایین ناسین بکات هەر زۆر زوو ئایین دەناسێتو ڕاستو ناراست لە یەك جیا دەکاتەوە هەندێك دەڵێن: دەی بۆ بابو باپیرانمان شتی وەهایان نەوتوە یان نەکردوە ئایا ئەوان نەزانو نەفام بون؟ بەڵام لە ڕاستیدا ئەمانە خۆیان نەفام دەکەن ئەگینا دەزانن ڕاستو ناراست کامەیەو بەهانەی قیامەتیان نەماوەو درۆیش دەکەن کە دەڵێن: ئێمە هەر بەڕێو شوێنی باو باپیرانمان دەڕۆینو لە قسەیان دەرناچین، چونکە ئەگەر بە قسەی باب وباپیریان بکردایە ئارەقەیان نەدەخواردو سەحنیان نەدەکرد و قوماریان نەدەکردو ژنو خوشكو کچی خۆیانیان ڕووت نەدەکردەوە بۆ خەڵكو دەیان ڕەوشتی پیسی تر کە کاتی خۆی بابو باپیرانمان زۆر لێی دوور بوون کەچی ئەمڕۆ دەیانکەن؟!! کەوابو ئەمانە درۆ دەکەنو بە قسەی بابو باپیرانیشیان ناکەن تەنها لە شتی پڕو پووچو داهاتودا کە ئەوەش تاوانە بە گوێی بابو باپیرانیان دەکەن ، کەلەڕاستیدا ئەوەش بەڵگەی بێ باوەڕیو لادانی خەڵکە لە ئایین، ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(١٠٥) ئەی خاوەن باوەڕان ئاگاتان لە خۆتان بێتو خۆتان بپارێزن لە تاوانو خراپەکاری زیان ناگەیەنێت بە ئێوە ئەو کەسەی کە خۆی گومڕا بوە ئەگەرئێوە شارەزابن، ئێوە هەموتان بۆ لای خوا دەگەڕێنەوە جا ئەو کاتە خوا خەبەرتان پێ دەدات بەوەی کە کردوتانە. ئەم ئایەتە بەروالەت وا دەگەیەنێت کە کەس کاری بە

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا ۚ أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ (١٠٤) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ ۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا اهْتَدَيْتُمْ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ (١٠٥) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا شَهَادَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ حِينَ الْوَصِيَّةِ اثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ آخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي الْأَرْضِ فَأَصَابَتْكُم مُّصِيبَةُ الْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِن بَعْدِ الصَّلَاةِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ إِنِ ارْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِي بِهِ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَادَةَ اللَّهِ إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الْآثِمِينَ (١٠٦) فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰ أَنَّهُمَا اسْتَحَقَّا إِثْمًا فَآخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ الَّذِينَ اسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ الْأَوْلَيَانِ فَيُقْسِمَانِ بِاللَّهِ لَشَهَادَتُنَا أَحَقُّ مِن شَهَادَتِهِمَا وَمَا اعْتَدَيْنَا إِنَّا إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ (١٠٧) ذَٰلِكَ أَدْنَىٰ أَن يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَن تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ (١٠٨)

کەس نەبێت هەر کەس بۆ خۆی خەریکە ، دەڵێن: ئەبوبەکر هەستاو حەمدو سەنای خوای کردو وتی: ئەی خەڵکینە ئێوە ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو بە شێوەی خۆی مانای ناکەن بە ڕاستی من بیستم لە پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: {إن الناس إذا رأوا المنكر لا يغيرونه أوشك أن يعمهم الله بعقابه /رواه الترمذي وابن ماجه، صححه الألبا / بە بێگومان خەڵك هەر کاتێ خراپەیان دیو بەرگریان نەکرد نزیکە خوای دەسەڵاتداریو باشکۆ تۆڵە لە هەمویان وەرگرێت }.

سەعیدی کوڕی موسەیب دەڵێ: ئەگەر فەرمانی چاکە کردنت داو بەرگریت کرد لە خراپە ئەوە ئیتر زیانت پێ ناگەیەنێتو ئەو کەسەی کە گومڕا بوە ئەگەر تۆ خۆت هیدایەت دارو ڕێگای ڕاست گرتبێ، ئاشکرایە وەختێك بە هیدایەت دراو دادەنرێت کە پەیڕەوی لە قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ بکات کە بەشێکیان پەیوەندی بە فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپەوە هەیە دیارە ئەگەر ئەمەت کرد ئیتر تاوانی تاوانباران نایەتە سەر شانی تۆ، بەڵام ئەگەر نەتکرد لە تاوانی ئەو تاوانبارانە بێ بەش نابیت ئەوان لە بەر تاوانەکەیانو تۆ لە بەر بێ دەنگیت. ئینجا ﷲ یاسای وەسیەت کردنی کاروانچیمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَۖ وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿١١٠﴾ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ﴿١١١﴾ إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾

(١٠٦) ئەی ئەوانەی کەباوەڕتان هێناوە شایەتی دان لەناو خۆتاندا لە کاتی وەسییەتی سەرەمەرگدا دەبێ دوو کەسی خاوەن داد لە خۆتان کەموسڵمان بێت یان دوو کەسی تر کە لە خۆتان نەبن واتە خەڵکی لای خۆتان نەبن یان موسڵمان نەبن ئەگەر ئێوە لەکاروانێدا بون جا مەرگ یەخەی گرتن‌و وەسییەتتان لەلا کردن ، جا ئەگەر خاوەن مردوەکە گومانی بو لەو وەسیەت بۆ کراوانە دەبێ ئەوان رابگرن لە پاش نوێژی عەسر ئەوسا سوێند بخۆن بە خوا لە بەر چاوی خەڵك‌و بڵێن ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لە بارەی ئێمەوە هەرگیز ئێمە ئەم شایەتیەی خۆمان ناگۆڕین بە هیچ بەهرەیەك ئەگەر چی ئەو گۆڕینیشە بەسوودی خزمی زۆر نزیکیشمان بێت‌و ئێمە شایەتی خوا ناشارینەوە چۆن بوە هەر ئاوەها بۆتان باس دەکەین جا ئەگەر ئێمە حەقمان شارد بێتەوە ، بێگومان کە ئێمە لە گوناهبارانین. ئیتر ئەمانە بەم شێوەیە سوێند دەدرێن‌و وەسێتەکە کاری پێدەکرێت، بەڵام ئەگەر هات‌و سوێندیان خواردو لە پاش دا دەرکەوت کە درۆیان کردوە ئەوە بەم شێوەیە دەبێ کە پاش باسکردنی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە باسی دەکەین. دەگێڕنەوە کاتێك کە دوو نەفەر وەسیەتیان لاکرا بو کابرای وەسیەت کەر چەند شتێکی پێ بو یەکێك لەوانە شتێکی بە نرخ بو کە بای هەزار درهەم بو ئەو شتە بە نرخە نەمابو، چونکە کابرا بەر لەوەی وەسیەت بکات هەمو کەل‌و پەلەکەی نوسیبوو خستبویە ناو بارخانەکەی‌و ئەو دوو نەفەرە بە ناوی (تەمیمی داری‌و عەدی کوری بەدا) کە هێشتا هەر گاور بوون بەو نامەیان نەزانی بو خاوەن حەقەکانیش پرسیاریان لێ کردبون ئایا بودەیلی کوڕی ئەبو مەریەم(کابرای مردو) هیچی فرۆشتوە وتیان: نەخێر پاش ماوەیەك ئەو شتە بە نرخە جامێکی زیو بوو لای زەرنگەرێك ناسیانەوەو کابرای زەرنگەر وتی: لەوانم کڕیوەو ئەوانیش وتیان: بەڵێ هی ئەو بوە، بەڵام ئێمە لێمان کڕیوە ئینجا خاوەن مافەکان کێشەکەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ ئێستا ئەوان ئیدعا دەکەن کە کڕیویانەو خاوەن مافەکان ئینکار دەکەن‌و ئیتر بە گوێرەی(**أن البَيِّنَةَ عَلَى المُدعِي وَاليَمِين عَلَى المُدعَى عَلَيهِ**) داوای شایەت لە کاسە بەرەکان دەکرا ئەوانیش شایەتیان نەبو ئینجا سوێند خواردن لە سەر واریسی بودەیل بو کە بەم شێوەیە ئەوانیش سوێند دران کەدەفەرموێ:

(١٠٧) جا ئەگەر دەرکەوت کە ئەو دوو کەسەی یەکەم دوچاری تاوان بوون بە هۆی ئەوەوە کە شایەتیەکەیان راست نەبوە دوو نەفەری تر دەبێ بهێنن لە شوێنی ئەواندا بوەستن دوای نوێژی عەسر لە مزگەوتا لەو نەفەرانە کەوا ئەم دوانەی ئەوەڵ ماڵەکەیان بۆ هێنابونەوەو نزیکترین خزمی کابرای مردوو ئەو دوو کەسە دێنن‌و لە جێگای ئەواندا دەوەستن ، ئەوسا سوێند دەخۆن بە خوا کە بە ﷲ شایەتی ئێمە شیاوترە لە شایەتیەکەی ئەوان کە لە پێشەوە دایان‌و ئێمە نامانەوێ دەست درێژی بکەین، چونکە بەڵگەی رۆشنمان هەیە ، جا ئەگەر هاتو ئێمە دەست درێژی بکەین، بێگومان کە ئێمە لە ستەمکارانین، ئینجا دەبێ ئەو ماڵە لەو دوو شایەتەی ئەوەڵ کە وەسیەتیان لا کرابو وەربگیرێتەوەو بدرێت بەم دووانەکەی تر کە خزمی نزیکی مردوەکەن. ئینجا خوای داناو ئاگا دەفەرموێ:

(١٠٨) ئەم رێگایە نزیکترە بۆ ئەوەی شایەتیەکان هەمویان لە رێگای خۆیانەوەو بەشێوەی راست‌و دروست جێ بە جێ بکرێن چونکە ئەگەر کابرا زانی ئەم ترسە گەورەیە هەیە، ئیتر ناتوانێ درۆ بکات یان خیانەت بکات یان تا بترسن کە سوێندەکەیان بە سوێند بەر پەرچ بدرێتەوە تا هەر لە ئەوەڵەوە درۆ نەکەن. ئینجا دەفەرموێ: لە خوا بترسن‌و گوێ بگرن لە فەرمانەکانی‌و ﷲ گەلی

فاسق ڕێنمای ڕێگای ڕاست ناکاتو نایگەیەنێت بەخۆشبەختی ، ئینجا ﷲ لەم ژیانەوە بەرەو مەحشەرمان دەباتو دەفەرموێ:

(١٠٩) ئەو ڕۆژەی کە ﷲ هەمو پێغەمبەران کۆ دەکاتەوە کە ڕۆژی قیامەتەو دەفەرموێ: چۆن وەڵام درانەوەو چیتان لە گەڵدا کرا؟ دەڵێن: خوایە ئێمە هیچ زانیارییەکمان لەو بارەوە نیە بە بێگومان تۆ هەرخۆت زانەری هەمو نهێنیەکانیو هەر خۆت دەزانی چییان کردووەو چۆن وەڵاممان دراوەتەوە ، ئەمە مانای ئەو نیە کە ئەوان هیچ نازانن بەڵکو ئەمە بەڵگەی ئەدەبی پێغەمبەرانە سەبارەت بەپەروەردگاری جیهان، وەئەوان هەمو شتێکیش نازانن لە فەرمودەی حەوزی کەوسەردا هاتوە کە فریشتەکان ڕێگا لە هەندێ کەسی ئۆممەتی پێغەمبەرمان ﷺ دەگرنو نایەڵن بێنە سەر حەوزەکەوەو ئاو بخۆن لەوەڵامی تکای پێغەمبەرماندا ﷺ دەڵێن: تۆنازانیت ئەوان چییان داهێنالەپاش تۆ ئەویش دەفەرموێ: دوریان بخەنەوە دوریان بخەنەوە، بەڵام بە گشتی ئاگادارن وەکو لەو فەرمودە دا کە دەڵێ ڕۆژێ دوو جار بەیانیانو ئێواران کردەوەی ئۆممەتکەی پێ پیشان دەدرێت کە بە چاکەمان کەیف خۆش دەبێتوبە خراپەکانمان ناڕەحەت دەبێت، بەڵام لە دادگای خوادا ناتوانن بڵێن چۆنیان کردووەو چۆن بوون لەگەڵ پێغەمبەراندا هەتا ﷲ پێیان نەڵێت و ئیجازەیان پێ نەدات ، ئینجا هەر کەس چی دەزانێت دەڵێت بەڵێ بەڕاستی ئەو کاتە کاتێکی ئەوەندە سەختە پێغەمبەران توانای قسە کردنیان نابێو هەر پێغەمبەرێك بێجگە لە پێغەمبەرمانﷺ لە بیری ڕزگاربوونی خۆیدایەو بەس، ئینجا ﷲ داستانی عیسامان بە کورتی بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١١٠) ئەی محمدﷺ باس بکە ئەو کاتەی کە خوا فەرموی: بە عیسای کوڕی مەریەم یادی ئەو هەمو نیعمەتانەی من بکە کە داومە بە تۆو بە دایکت لەوانە هەڵبژاردنی تۆ بە پێغەمبەرو پاکانە کردن بۆ دایکتو خۆشەویستکردنی هەردووتان لای خاوەن باوەڕانی ڕاستەقینەو چەندین نیعمەتی گەورەی تر لەوانە بە هێز کردنو یارمەتی دانت، بیربکەرەوە لەوکاتەی کە تۆمان بە هێز کردو یارمەتیمان دایت بە ڕۆحێکی پیرۆز کە بەو ڕۆحە بو دەتتوانی مرۆڤێکی مردو زیندو بکەیتەوە کە تۆ قسە دەکەیت لە گەڵ خەڵکدا لە ناو بێشکەداو هەمان قسە دەکەیت کە بوی بە پیاوی تەواو ئەوە بو ئەو کاتە کە لە بێشکەدا بو مەریەمی دایکی هێنایەوە ماڵەوەو لێیان پرسی ئەو منداڵەت لە کوێ هێنا؟ ئەویش قسەی بۆ نەکراو هێمای کرد بۆ لای عیسا عیسایش وتی:﴿من بەندەی خوامو کتێبی پێ داومو کردومی بە پێغەمبەر﴾ مریم/٣٠.

ئەمە لەو کاتەدا بو کە تازە لە دایك بوە هەر بەو شێوەیە کە گەیشت بە تەمەنی پیاوێکی گەورە لەو حالەتەش دا هەمان قسەی پێشووی کرد کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ژیریی عیسا لە کاتی لە دایك بونی بەو پلە گەیشتوە کە لە پیری دا خەڵکانی تر پێی دەگەن، وە بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە من تۆم فێری کتێبو دانایىو تەوراتو ئینجیل کردووەو بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە تۆ لە قوڕ شتی وەکو باڵندەت دروست کرد بە ئیزنی من ، جا فوت پێیدا دەکرد بە ئیزنی من دەبو بە باڵندەیەكو دەفڕیو تۆ ئەو کەسەی کە کوێری زکماگیو ئەوانەی کە دوچاری نەخۆشی بەڵەکی بوون بە ئیزنی من چاکت دەکردنەوە ، وە بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە تۆ دەت توانی لە ناو قەبرەکاندا مردو دەربهێنیو زیندوی بکەیتەوە بە ئیزنی من، وە بیر بکەرەوە لەو کاتەی کەوا من بەرگری جولەکەکانم کرد لە تۆ ئەو کاتەی کە تۆ بە چەندین نیشانەی ئاشکرا هاتبویتە لایان کەچی ئەوان هاتن بۆ کوشتنی تۆو من تۆم لە دەستی ئەوان پاراستو یەکێکی تریان کوشت ، وەك لە سورەتی النسا /١٥٨ دا باسکراوە ئەوسا کاتێك کە تۆ بەو نیشانە ئاشکرایانە هاتیتە لای ئەوان جوەکان دەیان وت: ئەمە بێجگە لەجادویەك یان جادوگەرێکی ئاشکرا شتێکی تر نیە، وە ئەم وشەیە بە ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ﴾ خوێندراوەتەوە. لە هەمو سەردەمێکدا چی زۆر گرنگ بوە ئەو پێغەمبەرانە لەو ڕێگاوە هاتون بۆ گەیاندنی پەیامی خوا بە خەڵك بۆ نمونە لە زەمانی موسادا سیحر لە هەمو شتێکی تر زیاتر ناوی بوە خوا شتێکی بە موسا داوە کە ئەو سیحرانە هەڵوەشێنێتەوەو لە زەمانی عیسا دا (پزیشك سالاری ) ڕەواجی هەبوە خوا هێزی زیندو کردنەوەو چارەسەری چەند نەخۆشی بێ دەرمانی بە عیسا داوەو لە زەمانی پێغەمبەرمان دا (صلوات ا وسلامه علیه وعلى سائر اخوانه من ا رسل ) ڕەوان بێژی باو بوەو پەیامەکەی خوا هەروەکو پەیامی ڕێ پێشاندانو خۆشبەختی هەمیشەیی مرۆڤە لەو بوارەشدا دەستی باڵای هەبوەو کەس نەیتوانیوە وەکو بچوکترین سورەتی ئەو بهێننو تا قیامەتیش ئەوەیان بۆ ناکرێت ، لێرەدا کە باسی پرسیارو وەڵامی قیامەتی کرد بە تایبەت لە ناو پێغەمبەران دا عیسای باس کرد، چونکە خەڵکێکی زۆر عیسا بە خوا دەزانن لە

قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةٗ مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿١١٦﴾ مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١١٧﴾ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١١٨﴾ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١٩﴾ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ﴿١٢٠﴾

بەر ئەوە عیسا لە بەر چاوی ئەواندا ئەم پرسیارانەی لێ دەکرێت تا دەرکەوێت کە خوا نیە، چونکە ئەگەر خوایە بۆ پرسیاری لێ دەکرێت؟

وە وشەی (**بإذنه**) چەند جار دوبارە کراوەتەوە تا دەرکەوێت کە عیسا ئەمانەی بە ئیزنو ئارەزۆی خوا بوە ئەگینا عیساش هەر بەندەیەکی خوایەو ناتوانێ سەر بەخۆ ئەم شتانە بکات ئینجا دەفەرموێ:

﴿١١١﴾ بیر بکەرەوە لەو کاتەی کەوا من وەحیم کردە لای حەوارییەکان (دۆستانی راستەقینەی عیسا)و وتمان: باوەڕ بهێنن بە منو بە نێرراوەکەم کە عیسایە وتیان: ئەوا ئێمە باوەڕمان هێنا ئەی خوایە تۆ شایەت بە کە ئێمە موسڵمانینو گەردن کەچین بۆ بەرنامە کەت.

﴿١١٢﴾ بیر کەرەوە لەو کاتەی کە حەوارییەکان بە عیسای کوڕی مەریەمیان وت: ئایا خوای تۆ توانای ئەوەی هەیە کە لە ئاسمانەوە خواردنێکمان بۆ بنێرێت؟ عیسا وتی: لە خوا بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕدارنو داوای شتی وا مەکەن.

(**يَسْتَطِيعُ**) بە (**تَسْتَطِيعُ ربك**) خوێنراوەتەوە،واتە: تۆ ئەتوانی داوا بکەی لە خوای خۆت.

﴿١١٣﴾ وتیان: ئێمە دەمانوێت لەو خواردنە بخۆینو دڵەکانمان ئارام بگرێت ، وە تا یەقین پەیدا بکەین کە تۆ راست دەکەیت لە گەڵ ئێمەداو تۆ پێغەمبەری خوایت، وە ئێمەش لە سەر ئەوە شایەتی بدەین شایەتیەك کەبە چاوی خۆمان دیبێتمان.

﴿١١٤﴾ عیسای کوڕی مەریەم هاواری کرد وتی: ئەی خودای من، ئەی پەروەردگارم لە ئاسمانەوە خوانێکمان بۆ بنێرە تا ببێت بە جەژن بۆ ئەوەڵو ئاخرمانو نیشانەیەکی گەورە بێت لە لای تۆوە بۆ ئەوەی بزانن کە من راست دەکەمو تۆش خاوەن دەسەڵاتیو رۆزیمان پێ بدە بە راستی تۆ لە هەمو رۆزی دەرەکان چاکتری.

ئینجا ﷲ وەڵامی عیسای دایەوەو فەرموی:

﴿١١٥﴾ من ئەوەتان بۆ رەوانە دەکەم ئەوساپاش ئەوە هەر کەس لە ئێوە کافر ببێت ئەو کاتە بە بێشك سزایەکی وای دەدەم کە هیچ کەسێکی تر ئاوا سزا نادەم ، هەندێك دەڵێن: ترسانو پەشیمان بونەوە لە داخوازییەکەیان، بەڵام زۆر لە هەواڵەکان وا دەگەیەنن کە داوای کردوەو خوایش لە ئاسمانەوە خوانێکی بۆ ناردوون ، لە جۆری خواردنەکەو چی کراوە بەو خواردنە قسەی جوراو جۆر کراوە یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئەو خوانە هاتو چل رۆژ بەردەوام بو بەیانیانو ئێوارانو بۆ هەر لایەك بچونایە بۆیان دەهات هەندێکی تر دەڵێن: عیسا دانیشت لە دەورەی خوانەکەو وتی: خوایە بۆمان نەکەی بە سزاو نارەحەتیو پاشان وتی: بخۆن وتیان: تۆ بیخۆ عیساش وتی: نەخێر من داوام نەکردوە ئەو کەسەی کە داوای کردوە با بیخوات ئینجا ئەوانیش نەیانخوارد، ئینجا عیسا هەرچی فەقیر هەبو دەعوەتی کردنو کۆبونەوە لە سەریو خواردیان ، وە هەرچی نەخۆشیش بو خواردیان لە دوای چەند رۆژێك هەڵگیرا، ئینجا ئەوانەی کە نەخۆش بون هەمویان چاك بونەوەو ئەوانەی کە نەیانخوارد بو زۆر خەمیان خواردو داوایان کرد با جارێکی تر ئەو خوانەمان بۆ بێت بەڵام تازە تەواو بو. هەندێکی تر دەڵێن خواردنەکە نانو ماسی بو هەندێکی تر دەڵێن هەر ماسی بو، بەڵام تامی هەمو شتێکی دەدا هەندێك دەڵێن میوەی بەهەشت بو لە چەندین جۆر هەمیشە چوار هەزار کەس دادەنیشت لە سەری هەر تەواو دەبو دیسان خوا وێنەی ئەوەی بۆ دەناردنەوە بەم شێوەیە مانەوە تا ئەو کاتەی کە خوا ئارەزۆی لێ بو ، هەندێکی تر دەڵێن: حەوت کولێرەو حەوت ماسی بوە تا ئارەزۆیان لێ بو لێیان دەخوارد تا هەندێکیان هەندێ لەو خواردنەیان دزیو وتیان: نەوەك ئیتر نەیەت ، لە بەر ئەوە ئیتر کۆتایی پێ هات ،

ئینجا ﷲ باسی موحاسەبەی عیسامان بۆ دەکات بە هۆی ئەوەی کە خەڵك بە خوایان زانیوەو لە بەر چاوی ئەو خەڵکەدا پرسیار

لە عیسا دەکرێت سەبارەت بەو کارە ناپەسەندەی پەیڕەوانیو دەفەرموێ:

(١١٦) باس بکە بۆیان ئەو کاتەی کە خوا بە عیسای کوڕی مەریەمی فەرمو: ئایا تۆ وتوتە بە خەڵك منو دایکم هەردووکمان دوو خوداین بێجگە لە اللهو دەبێ بمان پەرستن؟ عیسا وتی: پاكو بێ عەیبی هەر بۆ تۆیە ئەی خوایە بۆ من نیە قسەیەکی وا بکەم کە حەقو ڕاست نەبێت، ئەگەر من شتی وام وتبێت بەراستی تۆ ئاگات لێیەتی چونکە تۆ ئاگاداری بەوەی کە لە ناو دڵی من دا هەیە ، وە بەدڵنیاییەوە کە من هیچ نازانم لەوەی کە لای تۆدایە واتە ئەوەی کە تۆ ئێمەت ئاگادار نەکردبێتەوە ئێمە هیچی لێ نازانین، بەڵام هەر خەتەرەیەك لە ناو دڵی من دا بووە هەیە تۆ ئاگاداری پێی بەبێگومان تۆخۆت زانەری هەمو شتێکی پەنامەکیت.

(١١٧) خوایە من پێم نەوتون مەگەر ئەوەی کە تۆ ئەمرت پێ کردوم کە پێیان بڵێم، ئەویش ئەمە بو: وتومە بەندایەتی خوای منو خوای خۆتان بکەنو من شایەتم لە سەریان هەتا خۆم لە ناویاندان بووم ئەوەم هەر پێ وتونو پێم ڕاگەیاندون جا کاتێکیش کە منت هەڵگرت لە ناو ئەو خەڵکەدا تۆ خۆت چاودێرو نیگەهبانی ئەوانیو دەزانی چیان کردوەو چیان وتوەو تۆ خۆت ئاگاداری بە سەر هەمو شتێکدا ، بەڵێ پەیڕەوانی نەزانو نەفام ئاوا پیاوانی بەرز دەخەنە بەردەم پرسیارو وەڵامی دادگای دوا ڕۆژ هەرچەند کە عیسا لەم بارەوە هیچ تاوانی نیە، جاچاك بزانن چونە سەرگۆڕی هەر پیاو چاکێكو پاڕانەوە لێی شیرکەو ئەوپیاو چاکەش دادگای دەکرێ بۆدەمکوت کردنی ئەو پەیڕەوە نەزانو نەفامانەو بۆ بە درۆخستنەوەیان. وتراوە: "دوژمنی زانا باشترە لە دۆستی نەزان" ،

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {ئەگەر هەموتان کۆببنەوە بە ئینسانو بە جنۆکەوە لە سەر ئەوەی کە قازانجێك بگەیەنن بە ئینسانێك ناتوانن قازانجی پێ بگەیەنن مەگەر خوا ئیرادەی ئەوقازانجەی کردبێت، وە ئەگەر بتانەوێ زیانێکی پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر خوا ئیرادەی کردبێت کە ئەو زیانەی لێ بکەوێت} کەوابو داوا کردن لە هەر ئینسانێکی مردو داوایەکی زۆر بێ جێگایەو دوژمنایەتی کردنی مردوەکەیە، چونکە ئەو مردوە هیچ کات لە عیسا بە نرختر یان پایە بەرزتر نیە یان بەڵکو پێغەمبەرێکەوەکو عیسایە یان کەمترە دەی کە عیسا لە سەر ئەوە موحاسەبە بکرێت ئیتر کێی تر هەیە لەو موحاسەبەیە ڕزگاری ببێت؟ وە کام پیاو چاك وتویەتی: بانگم بکەن من دێم بە هاوارتانەوە؟! وە کام بەڵگەی شەرعی هەیە لە سەر بانگ کردنی پیاو چاکان؟ هیوادارم باوەڕ داران ئاگایان لە خۆیان بێت تاشەیتانو شەیتان سیفەتان هەڵیان نەخەڵەتێننو خوا پەرەستیەکەیان تێکەڵاو بە شیرك نەکەن چونکە هەر باوەڕ بونو کردەوە بەس نیە، بەڵکو پێویستە لە کردەوەکانماندا کەس نەکەین بە هاوەڵو ڕەفیقی خواو سیفەتی خوایی بە کەس نەدەینو ڕاستگۆ بین لە بەندایەتی خوادا چونکە تەنها ڕاستگۆیی دەبێ بە هۆی ڕزگاریمان لەو ڕۆژە سەختەدا. ئینجا عیسا دەپاڕێتەوە بۆ گەلەکەیو دەڵێ:

(١١٨) خوایە ئەگەر تۆ سزایان بدەیت خۆئەوانە بە بێگومان بەندەی خۆتنو هەر خۆت دەزانی چۆن ڕەفتاریان لەتەکا دەکەیتو ئەگەر لێیشیان خۆش بیت بێگومان تۆ هەر خۆتی دەسەڵاتدارو دانا. ئینجا ،

(١١٩) الله دەفەرموێ: ئا ئەمە ئەوڕۆژەیە کە ڕاستگۆیان ڕاستیەکەیان دەگاتە فریایانو هیچی تر سودی نابێو ناگاتە فریایان، نەعەشرەتو نە پارەو نەمەقام، تەنها ڕاستیو دروستی خۆی لە تەك خواو لە تەك دینەکەی خوادا فریای دەکەوێ ، بۆ ئەوانە هەیە چەندین باخچە کەلە ژێر ئەو باخچانەدا چەندین جۆگە دەڕواتو بۆ هەمیشە لەو جێگایەدا دەمێننەوەکە خوا بە هۆی کردارو ڕەفتاری پاکیانەوە ڕازیە لێیانو ئەوانیش ڕازین لە خوا لە سەر ئەو هەمو نازونیعمەتانەی کە پێی داون بە ڕاستی ئەوەیە بەهرەی گەورە. لەم سورەتەدا گەلێك یاسای باسکرد بۆمان چونکە ئێمە موڵکی ئەوزاتەینو لەناوموڵکی ئەودا دەژینو دروستکراوی ئەوین ئەولەخۆمان چاکتر ئێمە دەناسێتودەبێ بە گوێرەی بڕیاری ئەو ئیش بکەین ئەگینا مافی خۆیەتی تۆڵەمان لێ وەرگرێت چونکە لە موڵکی ئەودا بە گوێرەی بڕیاری ئەو ئیشمان نەکردوەوسپڵەو بێنمەکین. ئینجا کۆتایی سورەتەکە دەبەسێتەوە بە باقی یاساکانی تریەوەو دەفەرموێ:

(١٢٠) ئاسمانانو زەویو ئەوەی کە لە ناویاندایە هەموی موڵکی خوایەو ئەو دەسەڵاتی بە سەر هەمو شتێکدا هەیەو هیچ شتێك لە دەستی ئەو دەرناچێت. دەی مرۆڤ تۆ پارچەیەکی زۆر بچوکی ئەو موڵکەیت بۆ دەبێ ئەوەندە لاساربیت؟! یەکێك لەوانەش عیسایە،جا کە عیسا لە ژێر دەسەڵاتی خودا دایەو موڵکی خوایە ئیتر کەی خوایە؟! عەبدوڵا ی کوڕی عەمر دەڵێ: دواترین سورەت کە دابەزیوە سورەتی (**ا ائدة**)یە.

٦ سُورَةُ الأَنۡعَامِ ١٦٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَۖ ثُمَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ يَعۡدِلُونَ (١) هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن طِينٖ ثُمَّ قَضَىٰٓ أَجَلٗاۖ وَأَجَلٞ مُّسَمًّى عِندَهُۥۖ ثُمَّ أَنتُمۡ تَمۡتَرُونَ (٢) وَهُوَ ٱللَّهُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ يَعۡلَمُ سِرَّكُمۡ وَجَهۡرَكُمۡ وَيَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُونَ (٣) وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ (٤) فَقَدۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡۖ فَسَوۡفَ يَأۡتِيهِمۡ أَنۢبَٰٓؤُاْ مَا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ (٥) أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّن قَرۡنٖ مَّكَّنَّٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَا لَمۡ نُمَكِّن لَّكُمۡ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡهِم مِّدۡرَارٗا وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَنۡهَٰرَ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَنشَأۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِمۡ قَرۡنًا ءَاخَرِينَ (٦) وَلَوۡ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ كِتَٰبٗا فِي قِرۡطَاسٖ فَلَمَسُوهُ بِأَيۡدِيهِمۡ لَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ (٧) وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ مَلَكٞۖ وَلَوۡ أَنزَلۡنَا مَلَكٗا لَّقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ثُمَّ لَا يُنظَرُونَ (٨)

## ٦ سورەتی ئەنعام ١٦٥

سورەتی ئەنعام کە سورەتی شەشەمی قورئانەو سەدو شەستو پێنج ئایەتەو سورەتێکی مەکیەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاوپێنجەمەو پاش سورەتی (الحجر)و پێش (الصافات) شەو بە یەکجار لە مەکە دابەزیوە. هەرچەند ئیبنو سەلاح – ئەو ریوایەتانە کە دەڵێن ئەم سورەتە بە یەکجار هاتوە بە راستی نەزانیون. ئەبو ئیسحاقی ئیسفەرائینی دەڵێ: ئەم سورەتە تەواوی بنچوبنەماکانی بیرو باوەڕی تێدایە.

بە ناوی ﷲ ی زۆربە سۆزو بێنیها یەت میهرەبان

(١) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کەئاسمانانوزەوی دروست کردوەو تاریکیەکانوروناکی داناوەودروستی کردوە جا لە پاش ئەو هەمو بەڵگانە هێشتا ئەوانەی کە بێ باوەڕن هاوتا دادەنێن بۆ پەروەردگاری خۆیان.

(٢) ﷲ ئەو زاتەیە کە، ئێوەی دروستکردوە لە قوڕ چونکە هەمو لە ئادەمینو ئادەمیشی لە قوڕ دروستکردوە بەراستی، ئەگەر بە جوانیو بەوردی بیری لێ بکەینەوە دەبینین هەمو مرۆڤەکان ئێستاش هەر لە قوڕ دروست دەکرێن چونکە دروست بونی مرۆڤ بە هۆی ئەو ئاوە (**نطفە**) تایبەتیە کە لە پشتی پیاوو سنگی ئافرەتەوە پەیدا دەبێت کە ئەویش لە خۆراکەوە پەیدا دەبێتوخۆراکیش بە هۆی خاك بە قوڕ بوونەوە سەوز دەبێت کە مرۆڤ وحەیوانی تر سودی لێ وەردەگرن، ئەگەر ئاو نەبێت وزەوی نەکات بە قوڕ هیچ بەرو بومێك نابێتو هیچ کەسیش لەم زەویەدا نامێنێ ئینجا دەفەرموێ: لە پاشان خوا ماوەیەکی بۆ داناونولە کۆتاییدا دەبێ کۆچ بکەن لەم دنیادا، وەماوەی دیاری کراو کە بریتیە لە رۆژی قیامەت یان مەرگی هەر مرۆڤێك ئەوە لای خۆیەتیوکەس نایزانێت لە پاشان ئێوە گومانتان لە بارەی هاتنی قیامەتەوەهەیە یەقینتان نیە کە رۆژێکی ئاوەها دێتە پێشەوە. وە نازانن ئەو کەسەی کە توانیویەتی لەسەرەتادا دروستتان بکات هەروایش دەتوانێت زیندوتان بکاتەوە بۆ حیسابوکیتاب.

(٣) وە هەر خۆیەتی خوایە لە ئاسمانان ولە زەویدا، کەدەزانێ بە شتە نهێنیەکانتانو بە شتە ئاشکراکانتانو خوا دەزانێت کەئێوە چ ئیشێك دەکەن چاك یان خراپ.

لەم ئایەتەوە ئەوە وەردەگیرێت ، کە خوا لە هەمو شوێنێك بێت وە هیچ شوێنێك خاڵی نیە لە زانیاری خوا کە زانیاری دەگاتە هەمو کونو قوژبنێك ودەسەڵاتی بە سەر هەمو شتێکا هەیە کەواتە کەسی تر مافی فەرمانڕەوایی نیە بێجگە لە (ﷲ) چونکە یەکێك لە ماناکانی (ﷲ) حاکمیەتە وەك دەفەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي فِي ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٞ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَٰهٞۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡعَلِيمُ الزخرف: ٨٤\ هەر ئەوە لە ئاسمان فەرمانڕەوایەو لە زەویشدا فەرمانڕەوایە وە هەر ئەوە داناو زانا ﴾ واتە هیچ کەس بۆی نیە کە دژایەتی فەرمانڕەوایی بکات چ لە ئاسمانانوچ لە زەوی دا نەك بە مانای ئەوەیە کە زاتی ﷲ لە هەمو شوێنێکدا هەیە. پاش ئەوەی ﷲ باسی چەند سیفەتێکی خۆی کردو مرۆڤی لە خەو بێدار کردەوە، کە تا بزانێ هەرچی بکاتوهەرچی بڵێولە هەر کوێدا بێت وا لە ژێر چاودێری خوادا.

(٤) ئەمانە هیچ ئایەتێك لە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆیان نایەتەلایان مەگەر ئەوان پشتی تێ بکەنو گوێی پێ نەدەن. ئەمە نەك هەرخەڵکی ئەو سەردەمە بەڵکو خەڵکی ئەمڕۆی ئێمەیش هەر وایە کەئەو هەمو بەڵگە رونانەی قورئان دەزانینو رۆژ لە دوای رۆژ راستیودروستی قورئان چاکتر دەردەکەوێت جا لە باتی ئەوەی کە رووبکەینەوە دینی خواو زیاتر لێی نزیك ببینەوە کەچی پشتی تێ دەکەین هەروەك لێرەدا دەفەرموێ:

(٥) جابە راستی ئەوان بێ باوەڕ بوون بەو حەقە کاتێك کە هاتە لایان کە قورئانەو پێیان وابو کە درۆیەئەوسا بەم زوانە هەواڵی ئەو شتەی کە ئەوان گاڵتەیان پێ دەکرد پێ دەگات واتە

وَلَوۡ جَعَلۡنَٰهُ مَلَكٗا لَّجَعَلۡنَٰهُ رَجُلٗا وَلَلَبَسۡنَا عَلَيۡهِم مَّا يَلۡبِسُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٠﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ ٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ قُل لِّمَن مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ قُل لِّلَّهِۚ كَتَبَ عَلَىٰ نَفۡسِهِ ٱلرَّحۡمَةَۚ لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ ۞ وَلَهُۥ مَا سَكَنَ فِي ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١٣﴾ قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٤﴾ قُلۡ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٥﴾ مَّن يُصۡرَفۡ عَنۡهُ يَوۡمَئِذٖ فَقَدۡ رَحِمَهُۥۚ وَذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡحَكِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿١٨﴾

لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکرێت جا ئەو کاتە دەزانن چیان کردوە بە خۆیان.

﴿٦﴾ ئایا نابینن کە چەندین وڵاتو چەندین مەملەکەتو چەندین خەڵکی ناو ئەو مەملەکەتانەمان لە بەین بردوە لە پێش ئەواندا ، کە جێگیرمان کردبون لەم سەر زەویەداو توانایی‌وهێزی چاکمان پێ دابون بە شێوەیەکی وا کە هێشتا بەو شێوەیە بە ئێوەمان نەداوەو لە ئاسمانەوە ئاومان بۆ دەناردن هەمیشەو بێ بڕانەوەو دامان بەوان چەندین جۆگە کە دەڕۆیشت بە ناو باخ و بیستانیان داوکەم کەم لە خۆیان بایی بوون‌وله باتی سوپاسی خوا دەستیان دایە دژایەتی فەرمانەکانی خواو خوایش سەر ئەنجام لەو دنیایەدا لە ناوی بردن‌وبردنیەوە بۆ تۆڵەو سزای گەورەتر وەك دەفەرموێ: جا ئیتر ئێمەش لە بەینمان بردن بە هۆی گوناهەکانی خۆیانەوە ، هەر گەلێك بە شێوەیەك لە بەین بران یەکێ بە باوو یەکێ بە بارانو یەکێك بە دەنگ وەیەکێکیش بە سەرو بن کردن . وە لە پاش ئەوانیش چەندین خێڵی ترمان دروستکرد.

﴿٧﴾ وە ئەگەر ئێمە کتێبێکمان بۆ رەوانە بکردایەتەخوارەوە کەنوسراوبوایە بە رێك‌وپێکی لە ناو کاغەزادا، جابە دەستی خۆیان دەستیان لێ بدایە بێگومان بێ باوەڕان دەیان وت: ئەمە بێجگە لە سیحرێکی ئاشکرا هیچی تر نیە. واتە ئەوان دەیان وت: ئەگەر کتێبێکمان بۆ بێتە خوارەوە ئێمە باوەڕت پێ دەکەین، بەڵام ﷲ دەفەرموێ: ئەگەر کتێبێکی رێك‌وپێکیشیان بۆ بنێرینە خوارەوەوخۆیان دەستیشی لێ بدەن‌وبە چاوی خۆیان بی بینن ئینجا هەر بە سیحری دادەنێن، بەڵێ ئەم بێ باوەڕانە هەر رۆژەی بەهانەیەك دەگرن‌و هەر دەمێك داوای شتێك دەکەن.

﴿٨﴾ جا دەشیان وت: جا ئەگەر محمدﷺراست دەکات با فریشتەیەکی لە گەڵ دا بوایەو شایەتی بۆ بدایە کە راستە. خوایش دەفەرموێ: ئەگەر ئێمە فریشتەمان بناردایە ئیش جێ بە جێ دەکرا چونکە ئەگەر فریشتە لە سەر داخوازی هات ئیتر سزای خوا دێت بە دوای دا لە پاشان مۆڵەتیشیان نادرێت ئەمە لە لایەکەوە. وە لە لایەکی تریشەوە دەفەرموێ:

﴿٩﴾ ئەگەر ئێمە لە گەل ئەو پێغەمبەرەی خۆماندا کە بەشەرە فریشتەیەکمان رەوانە بکردایە چونکە ئێوە فریشتە بە شێوەی خۆی نابینن دەبوایە بمانکردایە بە بەشەرو بەو پۆشاکەی ئەوان پۆشاکمان بۆ بکردایە دووبارە دەیان وت: باشە کێ دەڵێ ئەوە فریشتەیەوکێ دەڵێ ئەویش بەشەر نیە واتە: ئەمانە بۆ بەهانە دەگەڕێن‌و بەهانەش قەت دوایی نایەت کەوابو ئەی محمدﷺ تۆ حەق راگەیەنە بە تەواوی. واتە پێویست ناکات کەداعیانی حەق بلێن: کابرا فلانە بەهانەی هەیە با بەهانەی ببڕین بەڵکو پێویستە ئەوەی راستە بوترێت ئیتر کابرا باوەڕ دەکات یان نە تاوان لە سەر ئەوان نیە، ئینجا دڵخۆشی پێغەمبەر دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٠﴾ خۆ ئەگەرباوەڕت پێ ناکەن تۆ نارەحەت نەبیت چونکە ئەوە خوی هەمو بێ باوەڕانی پێش تۆیە، بە حەقیقەت پێغەمبەرانی پێش تۆ گاڵتەیان پێ کراوەورێزیان نەگیراوە جا ئەوە نەبێ هەروا ئەم کارە خراپەیان بۆ چوبێتە سەر بەڵکو بەوانەیان کەگاڵتەیان بەوپێغەمبەرانە دەکرد سزای ئەو گاڵتە کردنەیان پێ گەیشتو لە سزای خوا دەرباز نەبون. دەی ئەگەربەمەش هەر باوەر ناکەن.

﴿١١﴾ پێیان بڵێ: بڕۆن بگەڕێن بە سەر زەوی داو تەماشای سەرەنجامی بێ باوەڕانو خراپەکاران بکەن‌و بزانن عاقیبەتی ئەو کەسانەی کە بێ باوەڕ بون بەکوێ گەیشتو چیان بە سەر هاتوە وەك فیرعەون‌و پەیڕەوانیو گەلی سەمودو گەلی عادوگەلی شوعەیبو گەلی لوت، پاش ئەوەی کە ﷲ وەڵامی چەند رەخنەی بێ باوەڕانی دایەوە وا هەندێ لە هێزو دەسەڵاتوسۆزو سزای خۆی لە شێوەی پرسیار دا باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٢﴾ بڵێ: بۆ کێیە ئەوەی کە لە ئاسمانان‌وزەویدایە، ئەگەر چی لە چەند جێگای تر وەڵامیان داوەتەوە کە بۆ خوایە بەڵام

ئەوەندە لاساریان کردوە وەك هەر وەلامیان نەدابێتەوە وایە بۆیە خوا دەفەرموێ: بڵێ: هەر بۆ خوایەوکەسی تر خاوەنی نیە کەوای داناوە لە سەر نەفسی خۆی کە بەرەحمو بەسۆز بێت بەرامبەر بەبەندەکانی خۆی. تەماشا بکەن ئەو هەمو دژایەتیەی دەکرێت ، وە ئەو هەمو کفرو نارەواییە دەکرێت بەلام ئەو باران کە مایەی ژیانە دەنێرێتوزەوی ئاوەدان دەکاتەوە بۆمان؟! ئینجا دەفەرموێ:

ئەو (لـ)ە لە وشەی ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ﴾ لە وەلامی سوێندێکی لابراو دایە واتە سوێندبێ خوا کۆتان دەکاتەوە لە رۆژی قیامەتدا کە هیچ گومانێك لەو کۆکردنەوەولەو رۆژەدا نیە ئەوکەسانەی کە نەفسی خۆیان دۆڕاندوە ئەوسا ئەو کەسانەن کە باوەڕ ناهێنن ، واتە دۆڕاوو سەر شۆڕ لەو رۆژەدا بێ باوەڕانن. پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: { لما خلق ا الخلق كتب في كتابه فهو عنده فوق العرش إن رحمتي تغلب غضبي/متفق عليه/ واتە بە راستی خوا لە کاتێکا کە مەخلوقاتی دروستکرد لە کتێبێکدا لای خۆی لە سەری عەرش نوسی، بە بێگومان سۆزو رەحمەتی من زاڵ دەبێ بە سەر رقوقینم دا} ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

﴿١٣﴾ خۆهەر بۆ خۆیەتی ئەوەی کە لە شەو رۆژدا ئارام دەگرێتو بەندەی ئەوەو ژیانی لە دەیان دوژمنی ئاشکراونهێنی دەپارێزێتو لە ژێر دەسەلاتوهێزی ئەودان‌و هەر خۆیەتی بیسەری هەمو رازو نیازێك‌و زانەری هەمو ئیشەکان. ئینجا ﷲ فەرمان بە پێغەمبەرمانﷺ دەدات کە خەڵکی بەرەو یەکتا پەرستی بانگ بکاتودەفەرموێ:

﴿١٤﴾ بڵێ: ئایا بێجگە لە خوا بکەم بە دۆست بۆ خۆم کە ئەو خوایە دروستکەری ئاسمانان‌و زەویەو هەر ئەوە کە خواردن دەدات بە خەڵك‌و خواردنی پێ نادرێت بەڵکو ئەو زاتە پێویستی بە خواردن نیە ، ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: بەراستی من ئەمرم پێ کراوە کە من یەکەم کەس بم بۆ خۆ تەسلیم کردن بە خواوبۆ بەندایەتی ئەو یەکەم کەسم لە موسڵمانی ئەم گەلەو تۆ نەکەی لە ریزی موشریکاندا بیت. ئاشکرایە کە پێغەمبەرمانﷺ هەرگیز بە هاوەڵ دانان بۆ خوا رازی نەبوە کەواتە ئەگەر چاکترین بەندەی خوا تاوان بکات شایستەیە بۆ خوا سزای بدات، دیسان ﷲ دەفەرموێ:

﴿١٥﴾ ئەی محمدﷺ بڵێ: بە راستی من دەترسم ئەگەر نا فەرمانی خوای خۆم بکەم لە سزای رۆژێکی گەورە کەرۆژی قیامەتە ، کە ئەو رۆژە وەك قورئان دەفەرموێ: رۆژێکە ئەوەی کە حامیلەیە حەملەکەی خۆی فڕێ دەداتومنداڵ لە ترسا سەر سپی دەکاتوپیر دەبێت.

﴿١٦﴾ هەر کەسێك ئەو سزای رۆژی قیامەتەی لێ لادرێتوتووشی ئەو سزایە نەبێت بەراستی خوا رەحمی پێ کردوەو هەر ئەوەیە سەرکەوتن‌و سەرفەرازی ئاشکرا ، وەك دەفەرموێ: ﴿فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَ/آل عمران: ١٨٥/ بە راستی ئەوەی لە ئاگری جەهەنەم دور خرایەوەو خرایە بەهەشت بێگومان سەرکەوتوو خۆشبەختە﴾

﴿١٧﴾ خۆ ئەگەر خوا بیەوێت دوچاری بەڵایەکت بکات ئیتر هیچ کەسێك ناتوانێت لای ببات مەگەر خۆی واتە هیچ کەسێك ناتوانێ هیچ زیانێك بە کەس بگەیەنێ یان بەڵایەکی لە سەر لابات مەگەر خوا ئیرادە بکات ، زیان گەیاندنی خەڵکی بە یەکتر هۆی زیانن وەك تەوشێیەك دارێك ببڕێت، ئاشکرایە خۆی ناتوانێ بی بڕێت ئەگەر بە دەستی کەسێکەوە نەبێت، تەنها ئەوەندە جیاوازی هەیە کە لە مرۆڤ دا ئیرادە کردنی هەیە ئەویش بە بڕیاری خوا ، ئینجا دەفەرموێ: وە ئەگەر هاتوچاکەیەکت لە گەڵدا بکات دیسان کەس ناتوانێ رێگای لێ بگرێت چونکە ئەو بە سەر هەمو شتێکدا دەسەڵاتی هەیە وزیان‌و سود هەموی بە دەست خۆیەتیوهەر ئەودەتوانێ چی ئارەزۆ بکات لە ناو بەندەکانیدا بیکاتو خاوەن دەسەڵاتە ئەگەر ئێمە ئیمانێکی ئاوهامان بێت بۆ لە خەڵك دەترسین؟ هەروەك لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەرﷺ بە عەبدوڵای کوڕی عەباس دەفەرموێ: بزانە ئەگەر هەمو گەلان کوببنەوە لەسەر ئەوەی کە سوودیکت بی بگەیەنن ناتوانن ئەوسودەت بی بگەیەنن مەگەر خوا بۆی بڕیاردابیت ، هەروەها ئەگەر هەمو ئوممەت کوببنەوەلەسەر ئەوەی کەزیانێکت بی بگەیەنن ناتوان ئەوزیانەت بی بگەیەنن مەگەرخوالەسەری نوسیبیت.

﴿١٨﴾ جا هەر خوایە خاوەنی هێزو دەسەڵاتە بە سەر بەندەکانی خۆیداو هەمو خاوەن دەسەڵاتان گەردن کەچن‌و بێدەسەڵاتن بەرامبەر بەدەسەڵاتی خودا ، وە هەر ئەوە دانایە لە ئیشەکانی داو ئاگادارە بە سەر هەمو شتێکا گرتنەوەو بەخشینی بە بەندەکانی لە سەر بناغەی دانایی‌وئاگاییە نەك لە خۆوەو بە گۆترە کاری بێت بۆیە پێویستە خاوەن باوەڕان بە بەشی خۆیان قانیع بن‌و حەسوودی نەبەن بە خەڵکی خاوەن سەروەتو سامان ، ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٩﴾ ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: چ شتێك هەیە کە گەورەتر بێت لە بارەی شایەتەوە واتە شایەتێك کەلە هەمو شایەتێك گەورەتر بێت؟ پێیان بڵێ: خوایە لە هەمو شتێکی تر شایەتی گەورەترە ، وە ئەو شایەتە لە نێوان من‌و ئێوەدا کە من پەیامی ئەوم بە ئێوە

قُلۡ أَيُّ شَيۡءٍ أَكۡبَرُ شَهَٰدَةٗۖ قُلِ ٱللَّهُۖ شَهِيدُۢ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡۚ وَأُوحِيَ إِلَيَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَۚ أَئِنَّكُمۡ لَتَشۡهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخۡرَىٰۚ قُل لَّآ أَشۡهَدُۚ قُلۡ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَإِنَّنِي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُشۡرِكُونَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمُۘ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢١﴾ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ أَيۡنَ شُرَكَآؤُكُمُ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ لَمۡ تَكُن فِتۡنَتُهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ وَٱللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشۡرِكِينَ ﴿٢٣﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ كَذَبُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡۚ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَۖ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوكَ يُجَٰدِلُونَكَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٥﴾ وَهُمۡ يَنۡهَوۡنَ عَنۡهُ وَيَنۡـَٔوۡنَ عَنۡهُۖ وَإِن يُهۡلِكُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ وُقِفُواْ عَلَى ٱلنَّارِ فَقَالُواْ يَٰلَيۡتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢٧﴾

گەیاندوەو ئێوە دژایەتی منتان کردوەو ئەوەش لە پێشگای خوادا تۆمار کراوەو لە دوا رۆژدا منو ئێوە لە یەك جیا دەکاتەوە ، وە من بەردەوام دەبم لە سەر بانگەوازی خۆم و وەحی کراوەتە لای من ئا بەم قورئانە ، کەواتە قورئان وەحیەو لە لایەنی خواوە هاتوە ئەمە بناغەی سێهەمی بیرو باوەڕمانە کە باوەڕمان ببێت بەم قورئانە، تا بەم قورئانە بتان ترسێنم لە پاشە رۆژی ئیشی خراپو هەروەها ئەو کەسەی کە ئەم قورئانەی پێ دەگات کەوابو هەر کەسێك دەنگی قورئانی پێ گەییوناوی بیست ئەوە ئۆممەتی محمدەﷺوپێویستە لە سەری بە گوێی ئەو قورئانە بکات خۆ ئەگەر لای دا بێگومان سزا دەدرێت ، وە پێیان بلێ: ئایا ئێوە شایەتی دەدەن کە لە گەل خوادا خوایە کی تر هەیە؟ بلێ: ئەگەر ئێوە ئەو شایەتیە ناڕەوایەش بدەن من هەرگیز ئەو شایەتیە نادەم، چونکە درۆیە بلێ: بەراستی تەنها یەك خوا هەیەوبێگومان کە دورم لەوەی کە ئێوە بۆ خوای دادەنێن چونکە ناڕەواو نادروستەو تاوانێکی زۆر گەورەیە، ئینجا ﷲ لاساریوخراپی ئەهلی کتێب باس دەکاتودەفەرموێ:

﴿٢٠﴾ ئەوانەی کە ئێمە کتێبمان پێ داون کە تەوراتوئینجیلە ئەوەندە بەرونی باسی ئەم پێغەمبەرەیان ﷺتێدا کراوەکە دەیناسن هەروەك چۆن کوڕی خۆیان دەناسن واتە لە راستیودروستی پێغەمبەرو بەرنامەکەیدا گومانیان نیە بەڵکو لە بەر حەسادەتولاساریان باوەڕ ناهێنن کەئەوانە کەسانێکن نەفسی خۆیانیان دۆڕاندوە چونکە ئەوانە باوەڕ ناهێنن.

﴿٢١﴾ کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسانەی کە ئیفترا ودرو بە دەمی خواوە بکەن؟ یان بێ باوەڕ بێت بە ئایاتەکانی، ئاشکرایە ئەو کەسانەی کە درۆ بە دەمی خواوە بکەنوباوەڕ بە ئایەتەکانی نەکەن ستەمکارنو بێگومان هەرگیز مرۆڤی ستەمکار سەرکەوتوو رزگار نابێت ئەمەش موژدەیەکی خۆشە بۆ موسڵمانان کە ستەمکاران هەرچی بکەن سەرئەنجامیان هەرشکستو فەوتانە.

﴿٢٢﴾ ئەوسا باسی ئەو رۆژە بکە کە هەمویان کۆ دەکەینە کە رۆژی قیامەتە، پاشان بە ئەو کەسانەی کە هاوبەشیان بۆ خواداناوە دەڵێین: کواو لە کوێیە ئەو هاوبەشانەی کەداتان ناوە بۆ منوئەتان وت ئەوانە خوانو پارێزگاریمان لێ دەکەنو دێن بە هاوارمانەوەو پاڵ پشتمانن؟ با بێنە پێشەوە ، واتە لەوڕۆژەدا هیچ پەرستراوێك جورئەتی هاتنە پێشەوەو تکاکردنی نییە بەڵکو هەرکام لەوان هەوڵ دەدات کە ئەوتاوانە لەسەرخۆی لاببات و لایەنەکەی تر تاوانبار دەکات؟!

﴿٢٣﴾ لە پاشان هیچ شتێکیان بۆ نامێنێتو هیچ قسەیەکیان نیە بیکەنو هیچ بەلگەو بەهانەیەکیان نیە کە وەڵامی خوای داناو ئاگا بدەنەوە مەگەر ئەوە نەبێ کە دەڵێن: سوێند بە ﷲ ئەی پەروەردگارمان ئێمە هەرگیز هاوەڵ دانەر نەبوین، بەڵێ ئەو هاوەڵ دانەرانە کاتێ کەدەبینن کە بێجگە لەمرۆڤانی راستو دروستو نوێژ کەر کەسی تر ناچێتە بەهەشتەوە دەڵێن با ئێمەش بدەین لە ژێری کردارە ناپەسندەکانی خۆمانو سوێند بخۆین کە هاوەڵمان بۆ خوا دانەناوە وا دەزانن ئەو جێگایەش هەروەك دنیایە کەبە درۆ بۆیان بچێتە سەر ئا بەو شێوەیە سوێند دەخۆنو پاکانە دەکەن بەڵام خوای تواناو زانا دەمیان لە کار دەخاتو دەستو قاچیان دێتە قسەو هەمو کردارەکانیان ئاشکرا دەکەن ، ئا ئەوانەی لە دنیادا حەوت حەوت قسەیان کەڵەکە دەکردو هیچ حیسابیان بۆ پاشە رۆژ نەدەکرد ئاوا سەرشۆڕانە خۆیان بە درۆ دەخەنەوە وەك خوا دەفەرموێ:

﴿٢٤﴾ تەماشاکە چۆن خۆیان بە درۆ دەخەنەوەو لێیان گوم بوو ئەو درۆیەی کە دەیانکرد لە دنیا داو هاوەڵیان بۆ خوا دادەنا.

﴿٢٥﴾ جا هەندێك لەوان دێن گوێ دەگرن لە تۆ بەڵام چونکە گوێ گرتنەکەیان بۆ ئەوە نیە کە خۆیان پاك بکەنەوەو نایانەوێت پەیڕەوی حەق بن لە بەر ئەوە وائێمەش لە سەر دڵەکانی ئەوان پەردەمان دانا کە ئیتر ئەوان حەق نەبیستن

بَلْ بَدَا لَهُم مَّا كَانُوا يُخْفُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَلَوْ رُدُّوا لَعَادُوا لِمَا نُهُوا عَنْهُ وَإِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالُوا إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰ إِذْ وُقِفُوا عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۚ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٠﴾ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا جَاءَتْهُمُ السَّاعَةُ بَغْتَةً قَالُوا يَا حَسْرَتَنَا عَلَىٰ مَا فَرَّطْنَا فِيهَا وَهُمْ يَحْمِلُونَ أَوْزَارَهُمْ عَلَىٰ ظُهُورِهِمْ ۚ أَلَا سَاءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٣١﴾ وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ ۖ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾ قَدْ نَعْلَمُ إِنَّهُ لَيَحْزُنُكَ الَّذِي يَقُولُونَ ۖ فَإِنَّهُمْ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ الظَّالِمِينَ بِآيَاتِ اللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدْ كُذِّبَتْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ فَصَبَرُوا عَلَىٰ مَا كُذِّبُوا وَأُوذُوا حَتَّىٰ أَتَاهُمْ نَصْرُنَا ۚ وَلَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ۚ وَلَقَدْ جَاءَكَ مِن نَّبَإِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٣٤﴾ وَإِن كَانَ كَبُرَ عَلَيْكَ إِعْرَاضُهُمْ فَإِنِ اسْتَطَعْتَ أَن تَبْتَغِيَ نَفَقًا فِي الْأَرْضِ أَوْ سُلَّمًا فِي السَّمَاءِ فَتَأْتِيَهُم بِآيَةٍ ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَمَعَهُمْ عَلَى الْهُدَىٰ ۚ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ الْجَاهِلِينَ ﴿٣٥﴾

ئەمەش لە سەر ئەوەیە چونکە ئەوان ئەو هاتو چۆیەی کەدەیکەن بۆلای تۆ ئەی محمدﷺبۆ مەبەستێکی چاك نایکەن، یان بۆ دەمبازییە یان بۆ تانەو تەشردانە یان بۆ جاسوسیوبلاو کردنەوەی هەواڵی موسلمانانەو شکاندنیانە لە بەر چاوی خەڵك جا ﷲ بە گوێرەی نیەتی خۆیان مامەڵەیان لە گەڵدا دەکات، وە بارێکی گران بە سەر گوێکانیانەوەیە بارێکی قورسی وا کە هیچ شتێکی راست نەبیسن ، وە ئەگەر هەمو ئایەتەکانیش ببیسن ئینجا هەر باوەڕیان پێ ناکەن هەتا ئەو کاتەی کە دێنە لای تۆودەمە دەمەت لە گەڵدا دەکەن کەکافرەکان دەڵێن: ئا ئەم قورئانە نیە مەگەر داستانوچیرۆکی پڕو پوچی خەڵکی رابردوە. ئینجا خوای داناو ئاگادار دوو سیفەتی پیسی بێ باوەڕان باس دەکاتودەفەرموێ:

(٢٦) ئەوسا ئەمانە بەرگری دەکەن لە خەڵكونایەڵن باوەڕ بهێنن بە پێغەمبەروبە قورئانو خۆیانیش پشتی تێ دەکەنو دوور دەکەونەوە لە باوەڕ هێنان بە راستی ئەمانە هەر تەنها نەفسی خۆیان دەفەوتێنن بەڵام شعورو هەستیان نیە.

(٢٧) ئەی بینەر ئەگەر تۆ ئەوان ببینی کاتێك کە ئەوێستێنرێن لە سەر ئاگری جەهەنەم جادەڵێن ئەی خۆزگە ئێمە جارێکی تر زیندو ببوینایەوەو بچوینایەوە بۆ دنیا ئیتر هەرگیز بێ باوەڕ نەدەبوین بە ئایەتەکانی پەروەردگارمانو ئەو کاتە ئێمەش باوەڕمان دەهێناو لە گەڵ باوەڕدارانده دەبوین. لە ناو ئاگردا ئەم ئاواتە دەخوازن بەڵام بێ سودە بۆیان چونکە تازە ناگەڕێنەوە. وەك دەفەرموێ:

(٢٨) تازە بێ سوودە ئاوات خواستن، چونکە ئەوەی کە زوو شاردبویانەوە هەموی ئاشکرا دەبێت خۆ ئەگەر جارێکی تریش ئەوانە بگەڕێنەوە بۆ دنیا بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو رەوشتە ناپەسندەی پێشویان واتە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دنیا ئەوە نەبێ کەئەوانە تەوبە بکەن نەخێر بە زوویی ئەو سزاو سەختیانەیان لە بیر دەچێتەوەودەست دەکەنەوە بە ئیشی خراپ و بێ باوەڕی ، وە بە راستی ئەوانە درۆزنن ئەگەر بە راستی باوەڕیان بوایە بە خواو بە رۆژی دواییوخوایان بە خاوەن هێزو دەسەڵات بزانیایە دژایەتی خوایان نەدەکرد بەڵکو ئەوان وادەزانن ژیان هەر ئێرەیەو حیساب و کتابێك لە ئارادانیە وەك خوا باسیان دەکاتودەفەرموێ :

(٢٩) خۆ دەڵێن زیندەگی نیە بێجگە لە ژیانێکی دنیاییو ئیتر ئێمە کە مردین زیندو نابینەوە ئەمە لە دنیادا وا دەڵێن.

(٣٠) جا ئەی بینەر کاتێ کە ئەوان ئەبینی کە لە دادگای پەروەردگاری خۆیان دانو خوا دەفەرموێ: ئایا ئەمە شتێکی راست نەبو کە لە دنیادا پێمان وتن: کە ئێوە زیندو دەکرێنەوەودادگایی دەکرێن؟ دەڵێن: بەڵێ وە ﷲ ی سوێند بە پەروەردگارمان، قسەیەکی راستودروست بو بەڵام ئێمە لاساریمان کرد خوا دەفەرموێ: دەی بچەژن سزا ، ئیتر سوێند خواردنتان سودی نیە بە هۆی ئەوە کە ئێوە بێ باوەڕ بوون لە دنیادا کەواتە دان پێدانانی ئەمرۆتان بێ کەڵکە بۆتان لەم ئایەتانە چەند شتێکمان بۆ دەرکەوت: **یەکەم** ـ ئاگری جەهەنەم هەیە. **دووهەم** ـ قسە لە گەل خوادا دەکرێت با کابرایش بێ باوەڕ بێت، بەڵام ئێمە تائەوکاتە چونیەتیەکەی نازانین. **سێهەم** : بێ باوەڕان دان دەنێن بە بێ باوەڕی خۆیاندا. **چوارەم** : لە پاش مەرگ گەڕانەوە بۆ ئەم دنیایە بۆ ئیش کردن نیە. ئینجا دەفەرموێ :

(٣١) بە راستی زیانیان کردوە ئەو کەسانەی کە بێباوەڕ بوون بە گەیشتن بە خوای خۆیان، هەتا قیامەتیان هات بە کتو پڕی. ئینجا وتیان ئەی هاوار بۆ ئێمە لە سەر ئەو کەمتەر خەمیو کۆتاییانەی کە کردومانە ئەوان ئەو کاتە گوناهەکانیان بە کۆڵی خۆیان هەڵ دەگرن ، ئاگادار بن بە راستی بارێکی خراپیان بە کۆڵەوەیە لەو رۆژەدا وا دیارە ئەم گوناهانە هەمو دەکرێن بە تەنودەکرێت بە بار بۆ خاوەنەکەیو ئەو دەبێ بە کۆڵی خۆی بەم لاو لادا بگەڕێنێت ئینجا خوای میهرەبان کەم تەمەنیوبێ کەڵکی ژیانی دنیامان بۆ باس دەکاتودەفەرموێ :

﴿٣٢﴾ خۆ ژیانی دنیا بێجگە لە گاڵتەو گەمەو سەرگەرمییەك شتێکی تر نیە، هەروەك چۆن منداڵان گاڵتەو گەمە دەکەنو لە دوای دا بێ تاقەت دەبنوهەر کەسێك بەرەو شوێنی خۆی دەڕواتەوە. وە ماڵی ڕۆژی دوایی چاکترە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن و پەرهیزکارن دەی ئایا ئێوە عەقڵتان نیە کە بیر بکەنەوەو ئەم ڕاستیانە بزانن و کات و ژیان و ماڵی خۆتان بە فیڕۆ نەدەنوبەر لە هاتنی حیساب حیسابێك بۆ خۆتان بکەن؟ بەڵێ ، دنیا کاتێ چاکە کە مرۆڤ ئیشی چاکی تێدا بکات چونکە دنیا کێڵگەی قیامەتە، ئەگەر بۆ ئەوە نەبێ ئیتر ژیانی دنیا سەراپا زیانە چونکە گەورەوبچوکی حیسابی لە سەرە هەروەك پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: { لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ ا جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ /الترمذی. صححە الألبا / ئەگەر بێتودنیا هەر هەموی بە ئەندازەی پەڕی مێشولەیەك لای خوا نرخی هەبوایە خوای گەورە نەی دەهێشت کە کافر یەك قومە ئاوی لێ بخواتەوە} واتە دنیا هیچ نیەو دوا کۆتایەو لە سەر چاکەی حیساب هەیەولە سەر خراپەی تۆڵە هەیەو ئەم ژیانە بە هەزاران ئاواتی ناو دەرونتەوە دەبێ ڕۆژێك بارگەو بنە بپێچیتەوەو بەرەو خانوی هەمیشەیی بڕۆیتو لە پێشگای پەروەردگاری داناو زانا دا بتوەستێنێتو پرسیاری گەورەو بچوکت لێ بکرێوئاشکراو پەنامەکییەکانت هەموی دەربخرێت، ئینجا خوای داناو میهرەبان دڵنەوایی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٣٣﴾ ئەی محمدﷺ بەڕاستی ئێمە دەزانین ئەو قسانەی کە ئەوان دەیکەن تۆ زۆر غەمبار دەکات ئەوسا بە بێگومان کەئەوان تۆ بە درۆ ناخەنەوەو تۆیان پێ ڕاستگۆیە بەڵام ئەو ستەمکارانە ئینکاری ئایەتەکانی ﷲ دەکەن چونکە پێغەمبەر ﷺ زیاتر لە چلساڵ لە ناو ئەوانەدا بوەو ناوبانگی بە (محمد الامین) دەرچووە جائەوان دەزانن کە محمد ﷺ درۆ ناکات بەڵام ئەوانە بێ باوەڕن بە قسەی ﷲ دەڵێن: ئەبو جەهل وتی: ئەی محمد ئێمە تۆ بە درۆزن نازانین بەڵام باوەڕمان بەوەی کە تۆ هێناوتە نیە ئینجا خوا ئەم ئایەتەی سەرەوەی ناردە خوارەوە. دیسان دڵخۆشی پێغەمبەرمان دەکاتﷺودەفەرموێ:

﴿٣٤﴾ ئەوسا بە ڕاستی بە درۆ خراونەتەوە پێغەمبەرانێ کە لە پێش تۆدا بوون جا ئەوانیش خۆیان گرتوە لە سەر ئەو بە درۆ خستنانەوەیانو ئازار دراون هەتا یارمەتی ئێمەیان بۆ هاتووە سەرکەوتون بە سەر دوژمنەکانیان داو هیچ گۆڕێنەرێکیش نیە بۆ بڕیارەکانی خوا کەبڕیاریشی ئەوەیە کە ئایین و پێغەمبەرەکانی سەرکەوێت ، دەی ئەی محمدﷺدڵنیابە کە تۆش سەرئەنجام سەردەکەویت ، وە بەڕاستی هەواڵی پێغەمبەرانی پێش خۆتت پێگەیشتوە کە گەلەکەیان چۆن ڕەفتاریان لە گەڵدا کردونو سەرئەنجام ئەوان سەرکەوتوونو خراپەکارانو دوژمنانیان تەفرو تونا کراونو لە ناو چوون ، واتە تۆیش خۆت بگرەو بەردەوام بە لە سەر بانگەوازەکەتو دڵتەنگ مەبە بە قسەو قسەڵۆکی بێ باوەڕان جا هەر وەك دڵخۆشی دەکات لە پەلە کردنو خۆ ناڕەحەت کردن سەبارەت بە باوەڕ نەهێنانی گەلەکەی دەیترسێنی و دەفەرموێ :

﴿٣٥﴾ خۆ ئەگەر تۆ پشت تێکردنی ئەوانت بەلاوە سەختەو ناڕەحەتیت کە ئەوان لەم قورئانە ڕادەکەنو بە گوێت ناکەنو باوەڕ ناهێنن دە فەرمو ئەگەر دەتوانیت زەوی کون بکەیتوبە ژێریا بڕۆیت بڕۆ کونی بکەو تا کوێ ئەڕوێ بڕۆ یان پلەکانەیەك دابنێوبڕۆ سەر کەوە بۆ ئاسمان ئەوسا نیشانەیەکی وایان بۆ بهێنە کە نەتوانن باوەڕت پێ نەکەن، ئاشکرایە کە پێغەمبەرﷺ ئەوەی پێ ناکرێت واتە : نابێ تۆ خۆت ناڕەحەت بکەیت و نیگەران ببیت لەوەی کە ئەوان باوەڕ ناهێنن، تۆ تەنها گەیاندنت لە سەرەوهیچی تر چونکە ئەگەر خوا ئارەزۆو بکات هەمویان کۆ دەکاتەوە لە سەر هیدایەتو ڕێگای ڕاست ، بەڵام خوا بڕیاری نەداوە کە بە زۆر کەس ڕێنمایی بکات چونکە ئەم دنیایە بۆ تاقیکردنەوە دروستکراوە جا ئەگەر خوا کەسێکی بە زۆر موسڵمان کرد یان بە پێچەوانەوە کەسێکی بە زۆر کافر کرد خەڵکی تر دەتوانن لە ڕۆژی دواییدا بڵێن: خوایە ئەی بۆ ئێمەیشت موسڵمان نەکرد یان کافرەکە دەڵێ: خوایە تۆ بە زۆر منت کافر کردوە من تاوانم چیە کەوابو هەمو کەس بەهانەی دەمێنێ بۆ قیامەت دنیاش وەك وتمان بۆ ئەوە دروست بوە کە کەس بەهانەی نەمێنێ لە ڕۆژی قیامەتا، وە ئەم ئایەتەوشێوەکانی بەڵگەی بێ سنوری دەسەڵاتی خوا پێشان دەدات نەك مانای وایە کە خوا نایەوێت خەڵك موسلمان بێ واتە خوادەتوانێ هەمو کەسێك موسڵمان بکات یان کافری بکات بەڵام لە ئەزەلدا بڕیاری دا وە کە ئەوە نەکات تا هەر کەس بە ئارەزۆی خۆی بێ لە گرتنونەگرتنی ڕێگای ڕاست دا. ئینجا ﷲ توندتر ڕوو دەکاتە پێغەمبەرمانﷺ ودەفەرموێ: تۆ خۆت نەخەیتە ڕیزی نەزانانەوە و هەڵوێستت وەك هەڵوێستی نەزانەکان نەبێت. ئینجا خوای داناو میهرەبان زیاتر دڵی پێغەمبەرمان ﷺ دەداتەوەو سنوری ئیشەکانی بۆ دیاری دەکاتودەفەرموێ: ئەرکی سەر شانی تۆ گەیاندنوڕوشن کردنەوەی خەڵکەوهیچی تر بانگەوازکەرانی ئایینی ئیسلام پێویستە بە چاکی ئەم ئەرکەی خۆیان بزانن و بەرژەوەندی (ا صلحة) نەکەن بە بەهانە بۆ لادان لە دەقی ئایەتوفەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ بانگ کەر (الداعی)

۞ إِنَّمَا يَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ يَسۡمَعُونَۘ وَٱلۡمَوۡتَىٰ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ ثُمَّ إِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ ﴿٣٦﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةٗ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٧﴾ وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا صُمّٞ وَبُكۡمٞ فِي ٱلظُّلُمَٰتِۗ مَن يَشَإِ ٱللَّهُ يُضۡلِلۡهُ وَمَن يَشَأۡ يَجۡعَلۡهُ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٣٩﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٠﴾ بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ إِن شَآءَ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ ﴿٤١﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَخَذۡنَٰهُم بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَتَضَرَّعُونَ ﴿٤٢﴾ فَلَوۡلَآ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَا تَضَرَّعُواْ وَلَٰكِن قَسَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِمۡ أَبۡوَٰبَ كُلِّ شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ إِذَا فَرِحُواْ بِمَآ أُوتُوٓاْ أَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ فَإِذَا هُم مُّبۡلِسُونَ ﴿٤٤﴾

گەیاندنوڕۆشن کردنەوەی لە سەرە ئیتر پەیڕەوی کردنو کەم وزیاد بونی خاوەن باوەڕان بە دەست ئەو نیەولەو سنورە تێ نەپەڕێت هەر کەسێك خۆی ئامادە نەبێت بۆ وەرگرتنی ئایین ئاینیش خۆی لەو نزیك ناکاتەوە وەك دەفەرموێ:

(٣٦) ئەو کەسانەی کە خۆیان دەیانەوێت گوێ بگرن لە تۆو راستی بزانن هەر ئەوانە جوابت دەدەنەوەو باوەڕ دێنن بەڵام ئەوانی تر مردونو مردوش قسە نابیستێ چ جای ئەوەی باوەڕ بهێنێت ، وئەو مردوانەش خوا لە رۆژی قیامەتدا زیندویان دەکاتەوەو ئەوەی باوەڕیان پێ نەکردوە بە چاوی خۆیان دەیبینن، ئەمە گاڵتە کردنە بە بێ باوەڕان واتە با هەر خۆیان بێ ئاگا بکەن رۆژێك دادێت کە بە ئاگا بکرێن کە رۆژی قیامەتە وەك دەفەرموێ: لە پاشان ئەوانە بۆ لای خوا دەگەڕێنەوەو ئەو حیسابی بێ باوەڕیان لە گەلدا دەکات.

(٣٧) جا ئەوان دەیان وت: جا با ئایەتێکی لە لایەن پەروەردگاریەوە بۆبهاتایە، ئاشکرا یە کە قورئانو هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی پێغەمبەرمان ﷺ گەورەترین بەڵگە بو لەسەر راستیو دروستی پێغەمبەرو بەرنامەکەی، بەڵام ئەوان مەبەستیان ئەو شتانە بو کە خۆیان داوایان دەکرد وەك لە سورەتی فورقان / ٧_٨ولە سوەتی الاسرا /٩٠_٩٣ دایە.

ئینجا دەفەرموێ: پێیان بڵێ: کە بێگومان ﷲ دەسەڵاتی ئەوەی هەیە کە ئایەتێك بنێرێ هەموتان ناچار بکات بە باوەڕ هێنان جا ئەگەر زانا بونایە داوای ئەو جۆرە نیشانانەیان نەدەکرد چونکە ژیانی دنیا بۆ تاقیکردنەوەیە نەك بۆ زۆرە ملێ. ئینجا خوای دانا سرنجمان بۆ گیاندارەکانی چوار دەورمان ڕادەکێشێو دەفەرموێ:

(٣٨) ئەوسا هیچ شتێك نیە لە سەر ئەم زەوییەدا بگەڕێتوهیچ باڵندەیەك نیە کە بە دوو باڵی بفڕێت جگە لەوەی کە ئەوانیش هەمویان گەلانێکن وەك ئێوەو دروستکراو و بەندەی خودانو بەرنامەیەکی تایبەتی خۆیان هەیەو بە گوێرەی بەرنامەی خۆیان رەفتار دەکەن بە راستی خوای داناوئاگا هەرچی پێویست بێت بۆ ژیانی ئێمە لەم سەرخاکەدا بۆی داناوینو باسی کردوەو خراپەکانی بۆ دیاری کردوینو دەفەرموێ: ئێمە کۆتایمان نەکردوە لەم کتێبەدا لە بارەی هیچ شتێکدا جا ئەگەر مەبەست لەو کتێبە (**لوح ا فوظ**) بێت ئاشکرایە هەمو شتێکی تیدا نوسراوە بە گەورەو بە بچوکەوە، وە ئەگەر مەبەست لەم کتێبەش قورئان بێت واتە ئەوەی کە مرۆڤ پێویستی پێی هەبێت بۆرزگار بوونی لە سزای دنیاوقیامەت هیچ کەمتەر خەمیو کۆتایی نەکراوەو هەموی تێدا دیاری کراوە کەوابو ئەوەی کە لەم کتێبەدا باسی نەهاتوە ئەوە شتێکی پێویستی مرۆڤ نیە لە بواری بیرو باوەڕو بەندایەتیدا، بۆیە پەروەردگار رازی نابێ کە ئێمە بەرنامەو یاسایەکی تر بۆ خۆمان هەڵبژێرین چونکە هەر ئەوچاکمان دەناسێتو دەزانێت چیمان بۆباشە، لە پاشان هەمویان بەرەو لای پەروەردگاری خۆیان کۆ دەکرێنەوە بۆ حیساب جا ئەگەر بێتو نەختێك وردببینەوە لە ژیانی گیانداران دەبینین بە شێوەیەك دەجوڵێنەوە زۆر گرنگوسرنج راکێشە، بۆ نمونە مرۆڤ ئەو هەموو هۆی پاك وخاوێنیەی ناسیوەو دروستی کردوە کەچی هێشتا نەیتوانیوە ژینگەی خۆی نیوە بە نیوە پاك بکاتەوە بەڵام مێش هەنگەکان ئەوەندە پاكوخاوێننوئیشیان ڕێکە ریشانەوەکەی ئەوان بۆ ئێمە دەرمانە، چۆلەکەیەك کە هێلانەیەکی دروستکرد بۆ خۆی تاقمێکی تر ناچن داگیری بکەن، مانگایەك چەند گا دوای دەکەوێت کاتێ یەکێکیان لێی پەڕی ئیتر یەکێکی تر ناچێ بە دەوریا ، حەیوانێك یان پشیلەیەك ئەگەر خواردنێکی پێ بدرێت زۆر بە هێواشیو لە سەر خۆو بێ خۆ شاردنەوە خواردنەکە دەخوات بەڵام ئەگەر خۆی بچێتە سەر ئەو خواردنە هەر کە خاوەن خواردنەکەی دی ڕا دەکات ، چونکە جاری یەکەم هەست بەئەوە دەکات کە ئیشەکەی خراپ نەبوە بەڵام لە جاری دووهەم دا دەزانێ کەئیشەکەی هەڵەیەوخۆی بە شیاوی تۆڵەو سزا دەزانێ بۆیە رادەکات، ئەم مێشولە بچوکانە جگە لەوەی کەزانست شتی گرنگی لەبارەوەیانەوە بۆدەرکەوتوە ئەڵێن جارێکیان موسا وتی: خوایە بۆ لە باتی ئەواندا زەلامێکت دروست نەکردوە؟ دەڵێن: خوا بە موسای فەرموە ئەی موسا ئەو

مێشولانەش وا بە تۆ دەڵێن : دەڵێن: یا ڕەبی ئەو شتە گەورەیە چیە دروستت کردوە لەوانەیە زۆر بە کەمی یادت بکات خۆ ئەگەر تەنیا کەللە سەری ئەوت بکردایە بە مێشوولە بە دەیان ملیۆن مێشولەی لێ دروست دەبو هەر لەحزەیەك دەیان ملیون جار یاد وزیکری تۆیان دەکرد ئەگەر چی ئەمە چیرۆکێکە ڕاستوناڕاستی هەر خوادەزانێت بەڵام بێگومان ماناکەی ڕاستە بۆیەهێنامان چونکە دروستکراوەکانی خوا هەموویان یادی خوا دەکەن وەك لە سورەتی (الاسرا / ٤٤) دا دەفەرموێ: ﴿ هەر حەوت ئاسمانەکانو زەوی‌وئەوەش کە لە ناو ئەواندایە تەسبیحاتی خوا دەکەن، وە هیچ شتێك نیە کە تەسبیحات و سوپاسی ئەو نەکات بەڵام ئێوە تەسبیحاتی ئەوان دەرك ناکەن بە ڕاستی ئەو بە حەوسەڵەیەو پەلە ناکات لە تۆڵە سەندنەوەی بەندەکانیو لێ خۆشبوە لە تاوانیان﴾ لەم ئایەتەوە بەچاکی ڕۆشنە کە ئەم قورئانە کەلامی خوایەو ئەوەی پێویستی مرۆڤ بێت تا قیامەت باسی لێوە کراوەو مرۆڤ پێویستی بە یاساو ڕێسایەکی تر نیە چونکە مرۆڤ نە لە خوا زاناترەو نە لەو چاکتر دەزانێ یاسا دابنێت، جا ئەوانەی کە لادەدەن لەم قورئانە بەڵگەی ناتەواوی قورئان نیە بەڵکو بەڵگەی نەزانینی ئەوانە وەك لێرەدا دەفەرموێ:

(٣٩) ئەوانەی کە بێ باوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە کەڕنو لاڵنو وان لە ناوتاریکاییەکانی هەوەس بازی ودنیا پەرستی‌و خۆ پەرستی‌ونەفامی دا هەر کەسێك کە خوا ئارەزۆ بکات بۆ گومڕا کردنی گومڕای دەکات، وە هەر کەسێکیش کە خوا ئارەزۆ بکات کە ڕێنمایی بکات لە سەر ڕێگای ڕاست دای دەنێ، بەڵام وەك چەند جاری تر وتراوە خوا ئەمە ناکات ئەگەر چی خوا ئارەزۆی هەرچی لێ بێت دەیکاتو کەس ناتوانێ دەست بخاتە کاریەوەو ڕێگای لێ بگرێت، ئەم جۆرە ئایەتانە بەڵگەی دەسەڵات و هێزی بێ سنوری خودان. ئینجا خوای خاوەن دەسەڵات ودانا دەفەرموێ:

(٤٠) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئادەی پێم بڵێن: ئەگەر سزای خواتان بۆ بێت لە دنیادا یان کوتوپڕ قیامەت بێت ئایا ئێوە پەنا بۆ بێجگە لە خوا دەبەن کەبێت بەهاوارتانەوە؟ واتە ئایا پێتان وایە کە کەسێکی تر لەو کاتەدا دەتوانێت بە هاوارتانەوە بێتو ئیشێکی ترتان بۆبکات؟ ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن وەڵامی بدەنەوە، ئەوەتە هەر لە دنیادا کاتێ کە ڕوداوێکی سەخت ڕوەدات ئێوە هەر هاواری خوا دەکەن کە لای دات لە سەرتان.

(٤١) نەخێر لەو کاتەدا تەنها هەر هاواری ئەو دەکەن و هەمو شتێکی ترتان لە بیر دەچێتەوە جا ئەگەر ئارەزۆی لێ بێت لای دەبات ئەوەی کە ئێوە لە دەستی ئاهو ناڵەتانە لەحاڵێکدا لەو کاتەدا لە ترسا هەرچیتان کردوە بە هاوەڵی خوا لە بیرتان دەچێتەوەو دەڵێن" هەر خوا خوایەو هەموی کاو بایە ".

(٤٢) بە ڕاستی ئێمە بۆ گەلانی پێش تۆش ئەی محمدﷺ پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردوە ، ئەوانیش دژایەتیان کردونوبە گوێیان نەکردون ئینجا ئێمەیش ئەوانمان گرفتاری شەڕو سەختی‌و زیانی گیانی‌ومالی کردوە بۆ ئەوەی کە ئەوان هاوار بکەنە لای خوا بەڵکو بەو هۆیەوە ڕوو بکەنەوە خواوڕێگای ڕاست بدۆزنەوە واتە سزاو ناڕەحەتی دنیایی بۆ ئەوەیە کە خەڵکی بیر بکەنەوە لە سەرچاوەی هەستی‌و گۆڕێنەری بارو دۆخەکان کە خوایەو بیناسنو بگەڕێنەوە بۆلای‌و ڕێبازەکەی بگرن، ئەوەتەدووبارە لێرەدا دەفەرموێ:

(٤٣) ئای ئەو کاتەی کە هاتە لای ئەوان سزای ئێمە دەبوایە ئەوان هاواری خوایان بکردایە بە ڕێك وپێکی‌وبە ئیخلاسەوە، بەڵام ئەوان دڵیان زۆر ڕەق بو شەیتان ئەوەی کە ئەوان کردبویان لە ئیشی خراپە بۆیانی جوان کردبوو نەیدەهێشت کە بیر لە سەرئەنجامی خۆیان بکەنەوە. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٤٤) جا لە بەر ئەوەی کە ئەوپەندو ئامۆژگاریەی کەبۆیان کرابو لە بیر یان بردەوەو لە تاوان‌وخراپەکاری نەگەڕانەوە ئەوسا دەرگای هەمو شتێکمان لێ کردنەوە لە چاك‌ولە خراپ هەتا لە خۆبایی بون بەوەی کە پێمان دانو دەستیان دایە کەیف و ڕابواردن بەشێوەی ناڕەوا ئەوسا ئێمەش لە ناکاودا ئەوانمان گرتوتۆڵەمان لێ سەندن ئیتر ئەوانیش بە تەواوی نائۆمێد بون لە هەمو شتێك‌و هیوایان بڕا ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوە کە ئەگەر هات‌ومرۆڤەکان ڕویان کردە کوفرو تاوان‌وخراپە کاریەوە خوا ئەوەندە لە سەر خۆو میهرەبانە ژیانی چاکیان پێ دەدات تا ماوەی تەمەنیان تەواو دەکەن، ئینجا بارگەو بنەیان بۆ دەپێچێتەوەو دەیان هێنێتەوە بۆ حیساب‌ودادگایی کردنیان. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: { إِذَا رَأَيْتَ ا يُعْطِي الْعَبْدَ مِنْ الدُنْيَا عَلَى مَعَاصِيهِ مَا يُحِب فَإِنمَا هُوَ اسْتِدْرَاجٌ ثُم تَلَا رَسُولُ ا ﷺ ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ... ﴾ /ا د، صححه الألبا / هەر کاتێ کە دیتان خوا دنیا ئەدات بە بەندەیەکی خۆی کە خراپەو تاوان دەکات بزانن کەئەوە ئیستدراجە واتە خوا پلە بە پلە دەیبات‌وبەرزی دەکاتەوە تا کۆتایی دێت ئینجا دەیخات‌وپشتی دەشکێنێ. لەپاشان پێغەمبەری خوا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ... ﴾ } بەڵام زۆر مرۆڤی ساویلکە هەیە بەوە دەخەڵەتێتو دەڵێ فلانە کەس خوا نیعمەتی زۆری پێداوەوخۆشبەختە

فَقُطِعَ دَابِرُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْۚ وَٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٥﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَخَذَ ٱللَّهُ سَمۡعَكُمۡ وَأَبۡصَٰرَكُمۡ وَخَتَمَ عَلَىٰ قُلُوبِكُم مَّنۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِ يَأۡتِيكُم بِهِۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ هُمۡ يَصۡدِفُونَ ﴿٤٦﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتَكُمۡ إِنۡ أَتَىٰكُمۡ عَذَابُ ٱللَّهِ بَغۡتَةً أَوۡ جَهۡرَةً هَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۖ فَمَنۡ ءَامَنَ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٤٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَمَسُّهُمُ ٱلۡعَذَابُ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٤٩﴾ قُل لَّآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ إِنِّي مَلَكٌۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُۚ أَفَلَا تَتَفَكَّرُونَ ﴿٥٠﴾ وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾ وَلَا تَطۡرُدِ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ مَا عَلَيۡكَ مِنۡ حِسَابِهِم مِّن شَيۡءٖ وَمَا مِنۡ حِسَابِكَ عَلَيۡهِم مِّن شَيۡءٖ فَتَطۡرُدَهُمۡ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾

ئیترنازانێت كه ئەوه تاقیكردنەوەی دنیایەو بەم زوانه قارون ئاسا خۆی‌و سەروەت‌و سامانی له ناو دەچێت. دەبێ ئەوەش بزانین كەئەگەر كابرا رووی كرده ئاینی خوا به تەواوی ئەوه خوا دەرگای هەمو خێرێكی بۆ دەكاتەوه بەڵام لەم ئایەتەدا چونكه مەبەست كافرانه دەفەرموێت دەرگای هەمو شتێكی بۆ دەكاتەوه واته دەرگای خێرو شەڕ له كافران دەكرێتەوەو سەر ئەنجام له ناو دەبرێن. وەك دەفەرموێ:

(٤٥) ئەوسا هەمو گەلێ كه ستەمكار بوون له ناوبران‌وسەر زەویان لێ پاك كرایەوه كه ئەمەش یەكێكه له نیعمەته فرەوانەكانی خواو بەڵگەی هێزو دەسەڵاتی بێ سنوری خوایەوبەڵگەی دادگەری پەروەردگارەو نایەڵێ كەس بەبێ دادگایی كردن رزگاری بێ ، وه سوپاس بۆ خوا كه پەروەردگاری عالەمه كه ئاوەها تۆڵه له ستەمكاران دەسێنێت‌و پیاوی چاك‌وزەوی رزگار دەكات له دەستیان.

(٤٦) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: خەبەرم بدەنێ ئەگەر خوای گەوره هۆی بیستنی ئێوه لاببات‌وكەڕتان بكات‌و هێزی بینینی ئێوه لاببات‌و كوێرتان بكات و مۆر بنێ به سەر دڵەكانتانداو راستی وەرنەگرن كام خوا هەیه بێجگه له (الله) كه چاوو گوێتان بداتێ‌وئەو پەردەیه له سەر دڵتاندایه لاببات؟ تەماشا بكه كه ئێمه چۆن پەیتا پەیتا نیشانەكانی خۆمان دەگۆڕین‌وراستیان بۆ رۆشن دەكەینەوەو ئەو هەمو باسه جۆراو جۆرانەیان بۆ دەكەین تا روو بكەنه ئاینی‌وخوا پەرستی كەچی هێشتا ئەوان له باتی باوەڕ هێنان پشت دەكەنه دینی خوا.

(٤٧) ئەی محمدﷺپێیان بڵێ: خەبەرم بدەنێ ئەگەر سزای خوا هات بۆتان به كوتوپڕی یان هەروا به ئاشكراو له بەر چاوی خۆتان دا سزای خوا بتان گرێتەوه ئایا چی دەكەن‌ودەسەڵاتتان چییه؟ ئایا له ناو دەچێت بێجگه له گەلی بێ باوەڕی ستەمكار؟ واته تەنها ستەمكاران له ناو دەچن دەبا له خوا بترسن، چونكه رۆژێكی رەش چاوەڕوانیانه لێرەدا پرسیارێك سەر بەرز دەكاتەوەو دەڵێ: مەگەر خوا نافەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ /الأنفال: ٢٥ / ئێوه خۆتان بپارێزن له خراپەو شیرك چونكه وەختێ سزا هات تەنها ستەمكاران‌وموشریكان ناگرێتەوه بەڵكو چاكەكانیش دەگرێتەوەولەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ هَلۡ يُهۡلَكُ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴾الأنعام: ٤٧ بێجگه له گەلی ستەمكارو موشریك كێ به هیلاكدا دەچێت؟ له رواڵەتدا ئەم دوانه دژی یەكن له وەڵامدا دەڵێین: هیلاك لێرەدا به مانای زیان‌و خەسارەتێكی وایه كه قەرەبو ناكرێتەوەو به هیلاك چوو رۆژێكی خۆش تر به خۆیەوه نابینێ ئاشكرایه ئەوه پاشه رۆژی موشریك‌وبێ باوەڕانه.

وشەی (ظلم) لێرەدا به مانای موشریكه له ئایەتی(٢٥) سورەتی ئەنفال بۆ خراپەو تاوانه بەگشتی‌و خاوەن باوەڕ توشی سزای دنیا دەبێت بەهۆی تاوانی ستەمكارانەوه بەڵام پاشەرۆژێكی روناك چاوەڕوانیەتی‌و له رۆژی قیامەتیشدا ئەو موسڵمانانه قازانج دەكەن بەو مەرجەی كه لەدنیادا ئەركی سەرشانیان بەرامبەر به خواو بەئایین ئەنجام دابێت كەوابو رووی ئایەتەكان جیان له یەكتری. ئینجا دەفەرموێ:

(٤٨) ئێمه پێغەمبەرانمان هەر بۆ ئەوه رەوانەكردوه كەموژده دەری بەهەشت بن بو ئەو كەسانەی كه چاكه دەكەن‌و ترسێنەری دۆزەخ بن بۆ ئەو كەسانەی كه خراپه دەكەن جا ئەو كەسەی كه باوەڕی هێنا بیءو ئیشی چاكی كردبێت ئیتر ئەوانه ترسیان نیەو له رۆژی قیامەتیشدا خەم ناخۆن ، لێرەدا ئەوەمان تێدەگەیەنێ كه خاوەن باوەڕی راستەقینه بێ ترسه له دنیاداو باكی له ستەمكاران‌و دەسەڵات‌و هێزیان نیەو ئارامه له كارو تەلاشی پاشەرۆژی دا بەڵام دەگونجێ له دنیادا خەمگین بێت له سەر زۆر شت چونكه بەشەرەو بەشەریش خۆشی‌و ناخۆشی كاری تێ دەكات بۆیه نەیفەرمو: خەمگینی نیەبۆیان، فەرموی له ئایندەدا خەم ناخۆن كه رۆژی قیامەته.

(٤٩) جا ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە سزایان پێ دەگات بە هۆی ئەوەی کە دەرچوون لە سنوری خواوئاینەکەی.

(٥٠) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: من ناڵێم بە ئێوە کە خەزینەکانی اللّٰه لە لای منەو هەر کەسێك موسڵمان بێت ئیتر ژیانی خۆش دەکەم، وە من ناڵێم کە غەیب دەزانم ، ئەو شتەی کە خوا خۆی بە منی نەفەرموبێت من هیچ شتێکی لێ نازانم ، ومن ناڵێم کە من فریشتەم بەڵکومنیش بەشەرێکم وەك ئێوە کەمن هەرپەیڕەوی لە ئەوە دەکەم کە وەحی دەکرێتە لامەوتەنها راسپاردەی خۆم رادەگەیەنم. ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئایا کوێرو چاو ساغ وەك یەکن؟ دەی بۆ بیر ناکەنەوەو ئەم راستیانە بزانن؟. ئینجا اللّٰه داوا لە پێغەمبەر ﷺ دەکات کە بەردەوام بێت لە سەر بانگەوازەکەی خۆیودەفەرموێ:

(٥١) جا بیان ترسێنە ئەی محمد ﷺ بەو قورئانەی کە پێمان سپاردویت ئەو کەسانەی کە دەترسن کە کۆبکرێنەوە لە پێشگای پەروەردگاری خۆیاندا کە لەو رۆژەدا بۆ ئەوان نیە هیچ دۆستێك کە پاڵپشتیان بێت ، وە هیچ کەسێکیان نیە کە تکایان بۆ بکات هەتا خوا ئیجازە نەدات، بەڵکو خۆیان بپارێزن لە شیرك‌وتاوان‌وخراپە تا بپارێزرێن لە سزاو تۆڵەی سەختی دوا رۆژ. وە ئەم ترساندنە بۆ هەمو کەسە بەڵام چونکە هەر ئەوان سودی لێ وەردەگرن بۆیە باسی ئەوانی کردوە، عەبدوڵا ی کوڕی مەسعود دەڵێ کۆمەڵێ لە پیاو ماقوڵانی قورەیش دایان بە لای پێغەمبەردا ﷺ وسوهەیب و بیلال و عەمار وخەباب و چەند کەسێکی تر لە موسلمانانی هەژارو لاوازی لا بو، وتیان : ئەی محمد ﷺ : ئایا تۆ ئەمانەت بەلاوە باشترە لە گەلەکەی خۆت؟ ئایا ئەوانە کەسانێکن کە خوا لە نێوان ئێمە دا هەڵی بژاردوون؟! ئایا ئێمە بێین ببین بە پەیڕەوانی ئەوان؟ تۆئەمانە دوور بخەرەوە لە خۆت ئەگەر دوریان بخەیتەوە لەوانەیە ئێمە پەیڕەویت بکەین لە وەڵامی ئەو جۆرە قسە هەڵانەدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ:

(٥٢) جا تۆ ئەوانەدوور نەخەیتەوەو پاڵ نەنێیت بە ئەو کەسانەوە کە خوای خۆیان دەپەرستن بە بەیانیان‌وئێواران واتە هەمیشە بەندایەتی خوای خۆیان دەکەن‌وتەنها خوایان دەوێت تۆ هیچ زیانێکت پێ ناگات لە بارەی ئەوانەوەو کارو کۆششی تۆش نابێ بە زیان بۆ ئەوان واتە هەر کەس بەگوێرەی ئیشی خۆی حیسابی لەگەڵدا دەکرێت ئەوسائەگەر بێت‌و تۆ ئەوان دەربکەیت ئەوە تۆ لە ریزی ستەمکاراندا دەبیت واتە ئەی محمد ﷺ ئەگەر تۆ ئەو کۆمەڵە فەقیرانە دەربکەیت لە بەر خاتری ئەوەی کە ئەو

وَكَذَٰلِكَ فَتَنَّا بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لِّيَقُولُوٓا۟ أَهَٰٓؤُلَآءِ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنۢ بَيْنِنَآ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَعْلَمَ بِٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٥٣﴾ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِنَا فَقُلْ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٥٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِتَسْتَبِينَ سَبِيلُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٥٥﴾ قُلْ إِنِّى نُهِيتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۚ قُل لَّآ أَتَّبِعُ أَهْوَآءَكُمْ ۙ قَدْ ضَلَلْتُ إِذًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ قُلْ إِنِّى عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَكَذَّبْتُم بِهِۦ ۚ مَا عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦٓ ۚ إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ ۖ يَقُصُّ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْفَٰصِلِينَ ﴿٥٧﴾ قُل لَّوْ أَنَّ عِندِى مَا تَسْتَعْجِلُونَ بِهِۦ لَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٨﴾ ۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلْغَيْبِ لَا يَعْلَمُهَآ إِلَّا هُوَ ۚ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ ۚ وَمَا تَسْقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعْلَمُهَا وَلَا حَبَّةٍ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْأَرْضِ وَلَا رَطْبٍ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٥٩﴾

دەوڵەمەندانە بێن لە دەورت کۆببنەوە تۆ دەچیتە ریزی ستەمکارانەوە چونکە ئەم ئایینە موڵکی خوای خەڵکەو هاتوە بۆ خەڵك لەم زەویەداو هیچ کەس لای خوا بەرزو نزم نییە مەگەر بە بەندایەتی زیاتر یان خراپەی زۆرتر کە یەکەمیان زۆرتر بە رێزەو دووهەمیان زۆرتر بێ رێزە.

(٥٣) هەر ئاوەها ئێمە تاقیان دەکەینەوە هەندێکیان بە هەندێکی تریان، مرۆڤە سادەو کەم دەستەکان باوەڕ دێنن‌و دەوڵەمەندە خۆ بە زل زانەکان لە ئایین‌و لە خوا پەرستی دوور دەکەونەوە تاکو ئەمە بکەن بە بەهانەیەك‌و بڵێن: ئەگەر ئایین چاك بوایە ئەوان بەر لە ئێمە باوەڕیان نەدەهێنا چۆن ئەوان دەزانن، کە ئەمە شتێکی راست و دروستە بەڵام ئێمە نازانین؟ جا ئەم قسەیە دەکەن تا بڵێن: ئا ئەو ساویلکەو نەدارانەیە کە اللّٰه منەتی خستۆتە سەریان‌ونیعمەتی خۆی رژاندوە بە سەریانداو لە نێوان ئێمە دا لە ئایین تێی گەیاندون‌و ئەوان لە ئێمە ژیرترو عاقڵ ترن؟ ئەی ئایا خوا نازانێت کەکێ بەراستی سوپاسی دەکات‌و کێیش گەنەکارە؟

(٥٤) جا هەر کاتێ هاتن بۆ لای تۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە بە نیشانەکانی ئێمە دەی تۆ پێیان بڵێ: سەلامتان لێ بێت بە راستی پەروەردگاری ئێوە بڕیاری داوە لە سەر خۆی کەرەحم وسۆزی هەبێ بۆتان، هەر کام لە ئێوە بە نەزانی ئیشێکی خراپ بکات لە پاشان تەوبەی لێ بکات پاش ئەوەی کە ئیشەکەی کردوە ئیشی

باش بكات بەبێگومان کەئەوزاتێکی لێخۆش بوو بە ڕەحمە بەرامبەرتان، واتە لێتان خۆش دەبێ.

جا تەماشا بکەن‌و بزانن کە خوای میهربان چ ڕیزێکی گەورەی دانا بۆ ئەو موسڵمانە سادەو فەقیرانە نەك نابێ لە مەجلیسی پێغەمبەردا دور بخرێنەوە بەڵکو خوا فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کرد کە هەر کات هاتنە لات تۆ پێیان بڵێ: سلام علیکم‌و مۆژدەیان پێ بدە بەو دوو شتە گرنگە کە ئەمە بەشێکە لەو سۆزە بێ سنورەی خوا سەبارەت بە خاوەن باوەڕانی سادەوفەقیر، بەڵێ بەڕاستی هەر خوایە لە کەس ناترسێ‌و هەر کەسێکیش ڕاستی لە گەڵدا بکات نائۆمێدو بێ بەشی ناکات، بە داخەوە ئەو جۆرە هەڵوێستانەش ئێستا هەر ماوە هەندێك کەس گلەیی دەکات و خۆی بە زانا دەزانێت‌و دەڵێت ئا ئەو منداڵ و ساویلکانە چین کە ئیدعای ئیسلام دەکەن‌و خۆیان بە شوێن کەوتوی ئیسلام دەزانن‌و لە بارەی قورئانەوە قسە دەکەن؟ بۆ ئەوان لە ئێمە باشتر دەزانن وە ئەوان لە ئێمە زیاتر ئیسلامیان خۆش دەوێت؟ ئا بەم جۆرە تانەو تەشەردانە ئەیانەوێت کە سەر لە خەڵکی تێك بدەن‌وماوە نەدەن کە خەڵك بۆ خۆی بیر بکاتەوە ، بە ڕاستی ئەمە قسەیەکی کۆنە لەبەر ئەوە لە سەر داعیانی ڕاستەقینە پێویستە کەرێز لەولاوە دڵسۆزانە بگرن‌و ئاینیان زیاتر بۆ ڕۆشن بکەنەوەو ئەو دوو مۆژدە بە نرخانەشیان پێبدەن‌و هەمیشە سەلامیان لێ بکەن‌و ڕیزیان لێ بگرن هەر پاش ئەم ئایەتانەپێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرمو: {وَ هَلْ تُرْزَقُونَ وَ تُنْصَرُونَ إلا بِضُعَفَائِكُمْ /أ دوء ه، صححه الالبا / ئایا ڕۆزیتان پێدەدرێت‌و یارمەتی دەدرێن‌و سەر دەکەون ئەگەر بە هۆی لاوازەکانتانەوە نەبێت؟} ئینجا دەفەرموێ:

(٥٥) هەر ئاوەها ئێمە درێژە دەدەین بە باسکردنی نیشانەکانمان ورۆشنی دەکەینەوە هەتا دەرکەوێت ڕێگای تاوانباران، وە تا تۆ ڕۆشنی بکەیتەوە کارو تەلاش‌ورێچکەو ڕێگای تاوانباران. وشەی (سبیل) بە فاعل‌ومەفعول دەخوێنرێتەوە ، بۆیە وامانامان کرد.

(٥٦) ئەی محمد ﷺ بڵێ: من بەرگری کراوم لەپەرستنی ئەوەی کە ئێوە دەی پەرستن بێجگە لە خوا، چونکە هەمویان شتانێکی بێ کەڵك و پروپوچن پێیان بڵێ: من پەیڕەوی لە ئارەزواتی ئێوە ناکەم بەڵکو من فەرمانی خوای خۆم چۆن بوترێت ئاوەها ئەکەم ، بێگومان ئەگەر بێت‌ودوای ئارەزۆاتی ئێوە بکەوم ئیترمن سەر لێ شێواوم‌و من لە سەر ڕێگای ڕاست نیم‌و وەك ئێوەش شەرمەندەی پێشگای الله دەبم.

(٥٧) پێیان بڵێ: بە ڕاستی من لە سەر ڕێگاو بەرنامەیەکی ڕۆشنم لە لایەن پەروەردگاری خۆمەوە، کە زۆر چاك دەزانم چی ئەکەم ، چونکە پەروەردگارم چاکی تێ گەیاندوم لە حاڵێکدا کە ئێوە بێ باوەڕن بەو ڕێگا ڕۆشن‌و بەرنامەو قورئانەی کە من هێناومە، خۆ لە لای من نیە ئەوسزایەی کە ئێوە پەلەی بۆ دەکەن‌و هیچ بڕیارێك لەم بارەوە نادرێت مەگەر لە لایەن خواوە بێت‌و کەسی تر مافی بڕیاروحوکمی نیە ئەوەی کە باسی دەکات ڕاستەو هیچ گومانی تێدا نیەو ئەوخۆی چاکترینی هەمو ئەو کەسانەیە کە ڕاست‌و ناڕاست لە یەك جیا دەکەنەوە. وە ئەمە بڕیارێکی گشتیەوکەس مافی حوکم کردن‌و حوکم دانی نیە بێجگە لە خوا ، چونکە خۆی دروستکەری ئەم بونەوەرەیەو هەر خۆی مافی بڕیاردانی هەیەوئەم مافەیشی نەداوە بە کەس واتەئەم یاساو حوکمانەی کە ئەمڕۆ دەکرێن هەموی دژی بڕیاری خودایە چونکە ئەو چاکترینی ئەوانەیە کە حەق‌و ناحەق‌وڕاست‌و ناڕاست لە یەك جیا دەکەنەوە ئیتر کەی ڕەوایە ئێمە واز لە بەرنامەو یاساکەی ئەو بهێنین‌و بەرنامەو یاسای کەسانێکی تر هەڵبژێرین کەنازانن بەیانی چییان بەسەردێت؟ ئەوەی کە بێگومان هەموی ڕاست بێ چۆن دەبێ بیگۆڕینەوە بە شتێك کە تێکەڵ لە ڕاست‌وناڕاست بێ؟ سەعاتێك ئیش بە سەددینار بێ کەی ژیرانەورەوایە بچین بۆ ئەوەی کە سەعاتی بە پێنج دینارە؟ ئیش بەیاسای دەستکرد هەربۆدنیایە بەڵام یاسای الله بۆدنیاو قیامەتە ،پەیڕەوی یاسای دەستکرد سوودەکەی ئەگەر هەیبێت هەر بۆ چەند ڕۆژێکی ئەم ژیانەیە بەڵام پەیڕەوی یاسای الله سوودی بۆدنیاو قیامەتە. یاسای زاتێك کە بەدیهێنەری مرۆڤەو هەمویان لەلای ئەو بەندەن‌و لەبەندایەتیدا یەکسانن‌و سوودو خەیری هەمویانی دەوێت چۆن وەك یاسای تاقم وپێڕێکە کە جگە لەتاقم‌و پێڕەکەی خۆی سوودی کەسی تری ناوێت؟

(٥٨) پێیان بڵێ: ئەگەر لای من بوایە ئەوەی کە ئێوە پەلەی بۆ دەکەن بەڕاستی دەمێك بو کە ئیش جێ بە جێ کراو بو، وە خوا زاناترە بە ستەمکاران. واتە ئەوەی کە ئێوە دەڵێن: با سزامان بۆ بێت ئەگەر بە دەستی من بوایە هەر زوو جێ بەجێم دەکردو ئیشەکەم یەکسەرە دەکردەوە ، بەڵام نە ئەوە لە دەست من دایەو نە خوایش بێ ئاگایە لێتان بەڵکو ئەو بە حەوسەڵەیەو ماوەتان پێ دەدات‌و لە کاتی پێویست‌ودیاری دا تۆڵە لە ستەمکاران وەردەگرێت. عائیشەی دایکی باوەڕداران(خوای لێی ڕازی بێ) وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ڕۆژێکی سەخت تر لە ئوحودت بە سەر هاتوە؟ فەرموی : بەڕاستی لە گەلەکەی تۆ ڕۆژی سەختم زۆر دیوە لە هەمویان سەخت تر ڕۆژی (عەقەبە) بو کاتێ کە باسی بەرنامەی خۆمم کرد بۆ (ئیبنوعەبدو یالەیل) کە ناوی مەسعود ی کوڕی کولال بو بەڵام ئەو وەڵامی چاکی منی نەدایەوەو بە خەمباری و کەسکونیەوە منیش هەستام و هاتم و

لە(قەڕنوسەعالیب)ـەوە هاتمەوە سەر خۆمو سەرم بەرز کردەوە تەماشام کرد هەورێك سێبەری بۆ کردوم تەماشام کرد دیم جبرائیل (درودی خوای لێ بێت ) لە ناوی دایەوبانگی کردمو وتی: بەراستی خوا بیستی ئەو قسەی کە گەلەکەت پێی وتیتو چۆنیان گەڕاندیتەوە، وە ئەوە فریشتەی چیاکانە کە ناردویەتی بۆ لات تا فەرمانی پێ بکەیت بە هەر شتێك کەدەتەوێت سەبارەت بەو گەلە ، پێغەمبەر ﷺفەرموی: فریشتەی چیاکان بانگی کردمو‌سەلامی لێ کردم لە پاشان وتی: ئەی محمدﷺبە راستی خوا بیستی ئەو قسەیەی کە گەلەکەت پێی وتیت و خوای تۆ منی ناردوە بۆ لات تا فەرمانم پێ بدەیت چۆن ئارەزوت لێیە ، ئەگەر ئەتەوێت من ئەو دوو چیا کە ئەوان کەوتبونە نێوانیانەوە بخەم بەسەریانداوهیچیان دەرنەچێت پێغەمبەری خواﷺفەرموی: {بَلْ أَرْجُو أَنْ يُخْرِجَ ا مِنْ أَصْلاَبِهِمْ مَنْ يَعْبُدُ ا وَحْدَهُ لاَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا /بوخاریومسلم وشەکە هی موسلمە/نەخێر بەڵکو هیوادارم خوا لە نەوەی ئەمانە کەسانێك دروست بکات کە بەندایەتی خوا بکەنو هاوبەشی بۆ دانەنێن} واتە : سزاو تۆڵەیان خرایە دەستی ئەو بەڵام ئەو چاوپۆشی لێ کرد ، وەئەمە لە گەڵ ئەو ئایەتەی سەرەوەدا کە فەرموی: ﴿قُل لَّوۡ أَنَّ عِندِي مَا تَسۡتَعۡجِلُونَ بِهِۦ.. الایە﴾ وەڵامەکەی بەم شێوەیە. ١. واتە: ئەگەر کاتی داواکردن بڕیاری سزا بە دەست پێغەمبەر بوایە جێ بە جێی دەکرد بەڵام لەم فەرمودەیەدا ئەوان داوای سزایان نەکردوەو لە کاتی قسەو گفتوگۆی ئەواندا نەبوە بەڵکو پاش هەستانی پێغەمبەروبڕینی ماوەیەك لە ڕێگا ئەم ئیختیارە بە پێغەمبەردرا تازە پێغەمبەرمان دڵی سارد بوتەوەوداوای ماوەیان بۆ دەکات.

٢. ئەگەر بە قوڵ تر وردبینەوە لە ئایەتەکە دەبینین کە مەبەستی پێغەمبەرمان ئەوەیە، کە بیرو باوەڕێکی ڕاستی یەکتا پەرستی لە ناو دڵی ئەواندا دروست بکات و راستیەکی بێ پێچو پەنا بەوان دەڵێت ئەو دەفەرموێ منیش بە شەرم وەك ئێوە حوکم کردنوبڕیار دانوسزا دان تەنها بە دەست خوایەومن ڕۆشن کەرەوەو جێ بە جێ کەری فرمانەکانی ئەوم جا ئەگەر بڕیاری سزا ڕاستەخۆ بە دەست خۆم بوایە منیش بە شەرم وەك ئێوەوحەز بە سەرکەوتنو تۆڵە سەندنەوە دەکەم لەوانەیە هەر کاتێ ئیش بگەیشتایە ئەو جێگایەی کە داوای سزاتان بکردایە منیش سزام بدانایە ، کەواتە هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوان ئەو ئایەتەو ئەم فەرمودەیەدا ئایەتەکە سەرچاوەی فەرمان پێشان دەداتو فەرمودەکە فەرمانڕەواکە، ﷲ پێغەمبەری کردوە بە سەر پشك نەك خۆی ڕاستەو خۆ فەرمانڕەوا بێت وﷲ اعلم. ئینجا خوای دانا دەفەرموێ:

وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٦٠﴾ وَهُوَ ٱلۡقَاهِرُ فَوۡقَ عِبَادِهِۦۖ وَيُرۡسِلُ عَلَيۡكُمۡ حَفَظَةً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ تَوَفَّتۡهُ رُسُلُنَا وَهُمۡ لَا يُفَرِّطُونَ ﴿٦١﴾ ثُمَّ رُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوۡلَىٰهُمُ ٱلۡحَقِّۚ أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَهُوَ أَسۡرَعُ ٱلۡحَٰسِبِينَ ﴿٦٢﴾ قُلۡ مَن يُنَجِّيكُم مِّن ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِ تَدۡعُونَهُۥ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةٗ لَّئِنۡ أَنجَىٰنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٣﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُنَجِّيكُم مِّنۡهَا وَمِن كُلِّ كَرۡبٖ ثُمَّ أَنتُمۡ تُشۡرِكُونَ ﴿٦٤﴾ قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ وَكَذَّبَ بِهِۦ قَوۡمُكَ وَهُوَ ٱلۡحَقُّۚ قُل لَّسۡتُ عَلَيۡكُم بِوَكِيلٖ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ نَبَإٖ مُّسۡتَقَرّٞۚ وَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٦٧﴾ وَإِذَا رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ يَخُوضُونَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيۡرِهِۦۚ وَإِمَّا يُنسِيَنَّكَ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَلَا تَقۡعُدۡ بَعۡدَ ٱلذِّكۡرَىٰ مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٨﴾

(٥٩) خۆ هەر لەلای ئەو زاتەیە کلیلەکانی غەیب، کەجگە لەخۆی هیچ کەس هیچی لێ نازانێت مەگەر خۆی شتێك پێشانی خەڵك بدات کەئەو شارەزایە بەوەی کە لە وشکیو لە دەریادا هەیە کە بەو دوو وشەیە هیچ جێگایەکی تر نامێنێتەوە، وە یەك پەلکە گەڵا ناوەرێت مەگەر ئەو پێی بزانێت واتە هیچ حەرەکەو جموجوڵێك ڕوونادات مەگەر ئەو پێی بزانێت و هیچ دانەیەك وتۆیەك لە تاریکاییەکانی زەوی دا نیە و هیچ تەڕیی و وشکاییەك نیە، مەگەر ﷲ لە کتێبی ڕۆشن کەرەوەدا کە بریتیە لە (لوح المحفوظ) هەمووی دیاری کردوە واتە هیچ شتێك لای خوا شاراوە نابێتو ئەوەی کە بووە هەیەو دەبێ هەمووی لە (لوح المحفوظ)دایەو تۆمار کراوە بە گوێرەی زانینی خواو ئەو زانینەش ناگۆڕێ.

(٦٠) خۆ ئەو زاتە ئەوەیە کە ئێوە دەمرێنێ بە شەو بە خەو کەبەشێکەلە مردنو دەزانێ کەئێوە لە ڕۆژا چی دەکەنو هیچی لە بیر ناچێتەوە لە پاشان لە ڕۆژا زیندوتان دەکاتەوە. شەو دەتان مرێنێ تا بحەسێنەوەو ڕۆژ کە هات زیندوتان دەکاتەوە تا جێ بە جێ بکرێت ماوەی ناوبراو کەبە دوا دا هاتنی شەوو ڕۆژ دەبێ بە هۆی تەواو بونی تەمەنی مرۆڤوگیانداران کەوابو خەوتنوهەڵسانی تۆ بۆ ئەوەیە کە ئەو ماوەیەی تەمەنت تەواو ببێتوبەرەو مەرگوماڵی دوایی بچیت لە پاشان گەڕانەوەتان

هەربۆ لای ئەوەو پاشان خوا خەبەرتان دەداتێ بەوەی کە کردوتانە لە چاكو لە خراپ.

(٦١) ئەوسا هەر خوایە خاوەنی هێزو دەسەلاتە بە سەر بەندەکانی خۆیداو ئەوچاودێر لە فریشتەکان ڕەوانە دەکات بۆ پاراستنی ئێوەو پاراستنی کردارەکانتان تا مەرگ دێت بۆلای هەر یەکێکتان ئەو کاتە کە مەرگ هات ئیتر ئەوانیش ناتوانن پارێزگاری بکەن، چونکە بڕیار دەری ئەسڵی بڕیاری مردنی داوە لە بەر ئەوە تەسلیمی فریشتەکانی گیان کێشان دەکرێتوخوا دەفەرموێ: ئەو کاتە نێراوەکانی ئێمە کە مەئموری گیان کێشانن دەتان مرێنێتو ئەوان کەمتەر خەمیوکۆتایی ناکەن واتە کاتێ کە مەرگ هات تازە قسەو باس نامێنێو دەبێ فەرمانی خوا بۆ مەرگی ئێوە جێ بە جێ بکرێت جا کتوپڕ دەتان مرێنن.

(٦٢)لە پاشان دەیانگەڕێننەوە بۆ لای خوا کە سەرپەرشتی حەقو ڕاستەقینەی ئەوانە . ئەمە دەگونجێ مەبەستی مرۆڤ بێ یان فریشتەکان مەئمور بن، ئاگاداربن هەر بۆ خوایە حوکمو بێجگە لە خوا کەس مافی حوکمی نیە. وە ئەو لە هەمو حەساوکەران بە پەلە ترەولە نیو ڕۆژدا حەساوی ئەو هەمو بەندانەی تەواو دەکاتو لەو ماوە کەمەدا چاکەو خراپەی تەواوی تەمەنی هەر مرۆڤێك ڕۆشنوئاشکرا دەکات.

(٦٣) پێیان بڵێ: کێ ڕزگارتان دەکات لەتاریکاییەکانی زەویو دەریادا؟ هاوار دەکەنە لای ئەو کاتێ کە دەکەونە نارەحەتیەوە بە زەبونانەو بە نهێنیەوە دەڵێن: ئەگەر خوا ڕزگارمان بکات لە ئەم نارەحەتیە ئیتر ئێمەش لە ڕیزی سوپاسگوزاراندا دەبین . واتە هەر کاتێ کەوتنە تەنگانەوە هاواریان لێ هەڵدەسێو ڕوو دەکەنە خوا، خوایش دەفەرموێ:

(٦٤)پێیان بڵێ: هەر خوایە ڕزگارتان دەکات لەو تارکاییانەو لەو تەنگانەو لە هەموونارەحەتیەکی تریش کە تەنها هەر ئەودەتوانێ ڕزگارتان بکات نەك کەسی تر کەچی ئێوەلە پاشان شەریك بۆ خوا دادەنێن. بە داخەوە دەتوانم بڵێم ئەوانەی کە لە سەردەمی هاتنی قورئاندا موشریك بوون زۆر جیاوازن لە گەڵ ئەم موشریکانەی ئەم سەردەمە باشتر بڵێم باوەڕداران و موناففقان و موشریکانی ئەم سەردەمە جیاوازن لە باوەڕداران و موناففقان و موشریکانی سەردەمی پێغەمبەرمانﷺ، بۆ؟ چونکە باوەڕداری پێشوو کاتێك کە ئایەتێکی بۆ دەخوێندرایەوە تا ئیشی پێ نەکردایە نەدەچوو بۆ وەرگرتنی ئایەتێکی تر بەلام ئێمە ئێستا ئەو هەمو ئایەتانە دەزانینو ئیشیشی پێ ناکەینو خۆشمان بە باوەڕدار دەزانین. موشریکانی پێشوو کاتێ کە دەکەوتنە نارەحەتیەوە هاواری خوایان دەکردو خۆیان یەکلا دەکردەوە بۆخواو کاتێ کە دەکەوتنەوە فەرەحییەوە دووبارە شەریکیان بۆ خوا دادەنا، بەلام خۆ بە باوەڕدار زانی ئەم سەردەمە کاتێ کە دەکەوێتە نارەحەتیەوە هاواری بێجگە لە خوا دەکات هاواری ئەم شێخوئەو پیاو چاكو قەبرو نەزەرگە دەکات واتە لە کاتی تەنگانەدا زیاتردەبن بە موشریك بە پێچەوانەی موشریکانی کۆن. موناففقی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ بۆیە موناففق بو چونکە حکومەتی ئیسلامی بوو دەترسا ئەگەر بێتوپێی بزانرێت کە موسڵمان نین تۆڵەیان لێ دەسێنن بۆیە موناففقییان دەکرد لە ترسی حوکمی ئیسلامی، بەلام خۆئەمڕۆ حاکمیەتی خواش نیە کەچی هەندێ لەخەڵك هەرموناففقی دەکات کەبەسەرو سیماو ئەنجامدانی هەندێ ئەرکی ئایینی بەرواڵەت موسڵمانە کەچی لە ژێریشەوە دژی خواو ئایینە کەجێگای داخو سەرسوڕمانە. دەتوانم بڵێم لە پاش سەرکەوتنی مەکە ئیتر ترس پەیدا بووە لە دڵی بێ باوەڕان داو مانای ئەم ئایەتە ڕۆشنتر دەبێتەوە کە دەفەرموێ:﴿جاء الحق وزهق الباطل.الایە/٨١ ئیسرا/ ڕاستی هاتو ناڕاست لەناوچوو﴾. ئینجا الله دەفەرموێ:

(٦٥) پێیان بڵێ: ئەوسا خوا خاوەنی دەسەلاتە کە سزاتان بۆ بنێرێ لە سەرتانەوە یان لە ژێری لاقەکانتانەوە یان لێتان بگۆڕێولە ناو خۆتاندا بتانکات بە بەش بەشوفرقە فرقەو حزب حزبو بە هەندێکتان هەندێکی ترتان بچەوسێنێتەوە، دەی تەماشا بکە چۆن ئێمە نیشانەکانیان بۆ باس ئەکەینوچۆن بۆیان ڕۆشن دەکەینەوە بەڵکو ئەوانیش هەست بەڕاستی بکەن. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاس دەڵێ: لە خزمەتی پێغەمبەرﷺدا بوین دامان بە لای مزگەوتی بەنی معاویەدا پێغەمبەر ﷺچوە مزگەوتودوو ڕکات نوێژی کردو ئێمەیش نوێژمان کردو پێغەمبەرﷺزۆر پاڕایەوە لە خواو فەرموی: { سَأَلتُ رَبي ثَلَاثًا فَأَعْطَانِي ثِنْتَيْن وَمَنَعَنِي وَاحِدَةً سَأَلتُ رَبي أنْ لَا يُهْلِكَ أمتي بِالسَنَةِ فَأَعْطَانِيهَا وَسَأَلْتُهُ أنْ لَا يُهْلِكَ أمتي بِالْغَرَق فَأَعْطَانِيهَا وَسَأَلْتُهُ أنْ لَا يَجْعَلَ بَأسَهُمْ بَيْنَهُمْ فَمَنَعَنِيهَا / امام احمدومسلم/ داوای سێ شتم لە خوا کرد، یەکەم: داوام لە خوا کرد کە گەلەکەم بە نقووم بوون لە ئاودا تێدا نەچێت خوا ئەوەی پێدام. دووهەم : داوام کرد لە خوا کە ئەم گەلەم بە گرانی لە ناو نەچێت خوا ئەوێشی دا پێم. سێهەم : داوام کرد لە خوا کە شەڕ لە نێوانیاندا ڕوو نەدات خوا ئەمەی لێ وەرنەگرتم} لە ڕاستی دا مانای ئەم ئایەتە ئەمڕۆ لە هەمو کاتەکانی پێشوو ڕونترە ئەوەتە بە هۆی لادانمانەوە لە یاساو شەریعەتەکەی خوا لە ئاسمانەوە بە تەیارەو موشەك وتۆپی گەورەوبچوك ئاگر باران دەکرێینو لە ژێر لاقمانەوە ساڵانە بەڵکو مانگانە بەڵکو ڕۆژانە دەیان کەسمان بە هۆی ئەلغامەوە گیان یان لای کەم لاق لە دەست دەدەن ، وە

بوین بە سەدەها کۆمەڵی جیا جیا هەر یەك لەوی تر تێغ ساو دەداو زۆر داریان بێ زۆریان وەك حەڵوا قوت دەداو بە بەهانەیەکی بچوك دەیان گیان لە ناو دەچێتو سەدان منداڵ بێ باب دەکرێتو دەیان بیناو کۆشکوتەلار وێران دەبێتو بەو حاڵەیشەوە باسی مافی مرۆڤ دەکەن!! لەم ئایەتەوە: ١- پڕ مانایی قورئان دەردەکەوێت، کەلە مەوپێش بەڵای سەریان وەك بەرد بارانی گەلی لوتوتۆفانی گەلی نوح لێکداوەتەوەو راستیشەو ئەمڕۆ فەزفی فرۆکە شەڕکەرەکان وساروخ وتۆپ لەوەی پێش رونترەو سزای ژێر لاقیان بە بومە لەرزە لێکداوەتەوە کە ئەوەیش راستەو ئەلغامەکانی ئەمڕۆی ژێر لاق رونترەو تیرەگەریو یاسای خێڵایەتی بە مانای بەش بەشی لێکدراوەتەوە کە ئەویش هەر راستەو ئەمڕۆ حزب حزبێنەیەو راست ترو رۆشنترە. ٢- لەم ئایەتەوە بە رونی دەردەکەوێت کە دەستە دەستەو حزب حزبینە نەك مافی مرۆڤ نیە بەڵکو شتێکە دژی مرۆڤایەتیو هۆی روو رەشیو لەناوچونی ئەخلاقو ئایینو مرۆڤایەتیەو ئەمرۆیش ئا ئەمە بە چاوی خۆمان دەبینین لە گەل بونی هەزاران حزبی جۆراو جۆر لە هەمو کات زیاتر مرۆڤ دەچەوسێتەوە ئینجا خوای دانا دەفەرموێ:

(٦٦) جا گەلەکەی تۆ ئەی محمدﷺ بێ باوەڕن بەم قورئانە لە گەل ئەوەشدا کەهەر ئەو قورئانە حەقوڕاستە ، پێیان بڵێ: من پارێزگاروچاودێری کەر نیم تا ئێوە لە هەڵە بپارێزم یان هەر کەسێك بەم لاو بەو لادا بڕوات تۆڵەی لێ بستێنم نەخێر ئەوە ئیشی من نیە. بۆ؟ چونکە

(٦٧) بۆ هەمو هەواڵێك شوێنی تایبەتی خۆی هەیەوهەر هەواڵێك کە پێتان دەڵێم لە کاتو وەختی خۆیدا دێتە پێش. وەك دەفەرموێ: ﴿**لِكُلِّ أَجَلٍ كِتَابٌ**/ بۆ هەر ماوەیەك نوسراوی تایبەتی خۆی هەیە﴾ رعد- ٣٨) وە لەمەو دوا دەزانن چیتان کردووەوچۆن تۆڵەتان لێ دەسەنرێت. ئینجا سەبارەت بەو کەسانە کە بێ باوەڕنوگاڵتە بە فەرمودەکانی خوا دەکەن دەفەرموێ:

(٦٨) هەر کاتێك دیت ئەو کەسانەیی کە زۆر دەچنە خوارەوە لە گاڵتە کردن بە نیشانەکانمانو تانەو تەشەر لە ئایینی خودا دەدەن لەم کاتەدا ئەرکی سەر شانی تۆ ئەوەیە کە پشتیان تێ بکەیت هەتا دەچنە ناو قسەو باسێکی ترەوە کە دژی قورئانو ئایین نەبێت، وە ئەگەر هاتوشەیتان لە بیری بردیتەوە کە تۆ لە ناو کۆمەڵێکدا دانیشتوی کەقسەی خراپ دەکەن هەر کە زانیت ئیتر نابێ پاش ئەوەی کە کەوتەوە بیرت دانیشی لە گەل ئەو گەلە ستەمکارەدا . هەندێك دەڵێن ﴿بعد﴾ لە پاش ئەوەی کە تۆ

وَمَا عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَلَٰكِن ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ وَإِن تَعْدِلْ كُلَّ عَدْلٍ لَّا يُؤْخَذْ مِنْهَآ ۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أُبْسِلُواْ بِمَا كَسَبُواْ ۖ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُواْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٠﴾ قُلْ أَنَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُنَا وَلَا يَضُرُّنَا وَنُرَدُّ عَلَىٰٓ أَعْقَابِنَا بَعْدَ إِذْ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ كَٱلَّذِى ٱسْتَهْوَتْهُ ٱلشَّيَٰطِينُ فِى ٱلْأَرْضِ حَيْرَانَ لَهُۥٓ أَصْحَٰبٌ يَدْعُونَهُۥٓ إِلَى ٱلْهُدَى ٱئْتِنَا ۗ قُلْ إِنَّ هُدَى ٱللَّهِ هُوَ ٱلْهُدَىٰ ۖ وَأُمِرْنَا لِنُسْلِمَ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧١﴾ وَأَنْ أَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّقُوهُ ۚ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۖ وَيَوْمَ يَقُولُ كُن فَيَكُونُ ۚ قَوْلُهُ ٱلْحَقُّ ۚ وَلَهُ ٱلْمُلْكُ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ عَٰلِمُ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْخَبِيرُ ﴿٧٣﴾

ئامۆژگاریت کردنوپێت وتن کە قسەکانتان هەڵەیە ئیتر دەبێ بڕۆیتو لە گەلیاندا دانەنیشیت.

(٦٩) وەبۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن هیچ کێشەیەکی ئەو تاوانبارانەیان لەسەرنیە واتە : ئەگەر دوور کەوتنەوە لێیان پاش ئامۆژگاری کردنیان ئیتر مەترسی ئەوەتان نەبێت کە خراپەی ئەوان ئێوە بگرێتەوە، بەڵکو هەر وەبیر خستنەوە پێویستە، هەندێ دەڵێن : هەر کەسێك کە خۆی موتەقی بو ئیتر قسەو رەفتاری بێ باوەڕان زیانیان پێ ناگەیەنێ ، بۆیە پێیان وتراوە دور بکەونەوە لێیان تا بەڵکو ئەو نەفامو بێ باوەڕانە بیر بکەنەوەو لە سەر ئەم مانایە حوکم بە ئایەتی (١٤. النسا) هەڵوەشاوەتەوە، بەڵام لە سەر مانای پێشوو هەر وەك ئەو ئایەتەی سورەتی "النسا"ئە. بەڵکو ئەوانیش بترسنوخۆیان بپارێزن لە سزای خوا. لەم بارەیەوە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: نەفسی خۆتان سوك مەکەن ، عەرزیان کرد کەی نەفسی خۆمان سوك دەکەین فەرموی: کاتێ کە بێ شەرعیەك دەبینن کە دژی دینی خوایەو دەکرێت ، ئێوەقسە ناکەن چونکە شەرم دەکەن لە کابرا کەچی شەرم ناکەن لە خوای خاوەن دەسەڵات مانای وایە نەفسی خۆتان سوك کردوە.

(٧٠) واز بێنە لەو کەسانەی کە ئاینەکەی خۆیان بە شێوەیەکی سادەو بە گاڵتەو گەمە گرتووەو ژیانی دنیا بێ ئاگای کردون لە خواو لە دوا رۆژ ، وە بە ئەو رابواردنی دنیاو لەزەتەکانیەوە

۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً إِنِّيٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ (٧٤) وَكَذَٰلِكَ نُرِيٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ (٧٥) فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ (٧٦) فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّي فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِي رَبِّي لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ (٧٧) فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّي هَٰذَآ أَكْبَرُ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّي بَرِيٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ (٧٨) إِنِّي وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ (٧٩) وَحَآجَّهُۥ قَوْمُهُۥ قَالَ أَتُحَٰٓجُّوٓنِّي فِي ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنِ وَلَآ أَخَافُ مَا تُشْرِكُونَ بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَشَآءَ رَبِّي شَيْـًٔا وَسِعَ رَبِّي كُلَّ شَيْءٍ عِلْمًا أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ (٨٠) وَكَيْفَ أَخَافُ مَآ أَشْرَكْتُمْ وَلَا تَخَافُونَ أَنَّكُمْ أَشْرَكْتُم بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا فَأَيُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ أَحَقُّ بِٱلْأَمْنِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ (٨١)

سەرگەرمو بێهۆش بوون ، جا تۆ ئامۆژگاری بکە بەو قورئانەو بیا نترسێنە لەو رۆژەی کە هەر کەس گرفتاری ئەو ئیشەیە کە کردویەتی ، تا بەڵکو بیر بکە نەوە پێش هاتنی ئەو رۆژەی کە بۆ ئەو کەسە بێجگە لە خوا هیچ دۆستێك و هیچ شەفاعەت کەرێك نیە ، وەئەگەر هەرچی هەیەو شکی دەبات بۆ رزگار بونی خۆی بیدات لێی وەرناگیرێت ئەوانە کەسانێکن ، کە سجن دەکرێنو تۆڵەیان لێ وەردەگیرێ بە هۆی ئەو کردارە خراپانەی کە کردویانە ئەوسا بۆ ئەوان هەیە **یەکەم**: خواردنەوەیەك لە ئاوی داخی دۆزەخ. **دووهەم**: سزایەکی ئێش‌وئازاردەرو دەردناك و ئەمەش ناحەق نیە بەڵکو بە هۆی ئەوەیە کە ئەوان بێ باوەڕ بون بە خواو بە نیشانەکانی.

(٧١) بڵێ: ئایا هاوار بکەینە کەسێك بێجگە لە خوا کە نە سودمان پێ دەگەیەنێتو نە زیان؟ وە پاشگەز ببینەوە لەم بیرو باوەڕە راستە پاش ئەوەی کە خوا رێنمایی کردین؟ وەك ئەو کەسەیە، کە شەیتان سەری لێ شێواندوە و شێتی کردوەو نازانێ چۆن دێتو دەڕواتو چی دەڵێت کە ئەو چەندین رەفیقی هەیەو بانگی دەکەن: وەرە بۆ رێنمونی لای ئێمە. پێیان بڵێ بە راستی رێنمایی خوا هەر ئەوەیە رێنماییو هۆی خۆشبەختی، وە ئێمە فەرمانمان پێ کراوە کە گەردن کەچ بین بۆ پەروەردگاری عالەم.

(٧٢) فەرمانیشی پێ کراوە کە نوێژ بکەنو لێی بترسن ، وە هەر بۆ لای ئەو کۆدەکرێنەوە. ئەوسا حیسابی گەورەوبچوکتان لە گەڵدا دەکاتوهیچی لا ون نابێ.

(٧٣) وە هەر ئەو زاتەیە کە ئاسمانان و زەوی دروستکردوە بە راستیو بۆ مەبەستێکی راست، جا بترسن لە رۆژێك کە هەر فەرموی: ببە. دەبێت کە رۆژی قیامەتە قسەی راستەو هەر بۆ ئەوە موڵكوئەو مالیکی هەمو بونەوەرەو پادشایەتیو لە ژێر چاودێری ئەو دایە ، ئەو رۆژەی کە فو دەکرێت بە کەڵەشاخدا ئەو کاتە کاتی لێ ترسانەو دەوترێت کێ پادشایەو کێ مالیکە کەس ناتوانێت وەڵامی بداتەوە، خۆی دەفەرموێ: هەر بۆ اللہ یە کەتەنهاو زۆردارە زانەری هەمو نهێنیو ئاشکرا یەکە واتە هەروەك ئاشکراکان دەزانێت هەر بەو شێوەیەش شتە شاراوەکان دەزانێتو ئەو دانایەو زۆر بەئاگایە ، وە ئەمانە هەم ناونوهەم وەسفی خودان. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {**يطوي ا عز وجل السماوات يوم القيامة ثم يأخذهن بيده اليمنى ثم يقول أنا الملك أين الجبارون أين المتكبرون ثم يطوي الأرض بشماله ثم يقول أنا الملك أين الجبارون أين المتكبرون /مسلم/**خوای دەسەڵاتداری بەشکۆ لەرۆژی قیامەتدا هەر حەوت ئاسمانگەکان دەپێچێتەوەو پاشان بەدەستی راستی دەیانگرێت، ئینجا دەفەرموێ: هەرمنم پادشا ، کوا زۆردارەکانی سەر زەوی کوا خۆ بەزلزانەکانی سەر زەوی با بێن هیچ کەس ناتوانێت وەڵامی بداتەوەوقسە بکات، پاشان زەوییەکانیش بەدەستی چەپی دەپێچێتەوەو دیسان دەفەرموێ: هەرمنم پادشا، کوا زۆردارەکانی سەر زەوی کوا خۆ بەزلزانەکانی سەر زەوی با بێن هیچ کەس ناتوانێت وەڵامی بداتەوەوقسە بکات} لە دوای ئەمە اللہ داستانی باپیرە گەورەی پێغەمبەرمان کە ئیبراهیمە بۆ پێغەمبەرﷺباس دەکات و دەفەرموێ:

(٧٤) باس بکە ئەی محمدﷺ کاتێ کە ئیبراهیم وتی بە باوکی کە ئازەر بو ئایا تۆ ئەو بتانە ئەکەی بە خوای خۆت؟ بە راستی من دەبینم کە خۆتوگەلەکەت وان لە گومڕاهییەکی ئاشکرادا. زانایان لە بارەی ناوی باوکی ئیبراهیمەوە یەك دەنگ نین هەندێك دەڵێن ناوی تارەح بووەودایکی ناوی مەسانی بووەو خێزانی ناوی سارە بووەودایکی ئیسماعیلی کوڕی ناوی هاجەرەیە کە جاریە بوە هەندێك دەڵێن ئازەر ناوی بتێك بووەو ئەم قسە رێی تێ دەچێت لە بەر ئەوەی کە بە زۆری خزمەتی ئەو بتەی دەکرد بەو ناوە بە ناوبانگ بوبێت. لە سورەتی مەریەمو شوعەرادا ئەم گفتو گۆیە زۆر بە درێژتر باسکراوە ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٧٥) هەر ئاوەها ئێمە ئەو هەمو موڵکەی ئاسمانان وزەویمان پێشانی ئیبراهیم داو لە هەمو راستیوحەقیقەتێك تێمان گەیاند تا ئیبراهیم ببێت بە یەکێك لەو کەسانەی کەدڵنیاو یەقینیان هەیە بەو هەمو راستیانەو ببێت بە (عین الیقین ) چونکە هەر شتێك پاش زانین بە چاویش ببینرێت ئیتر ئەوە هیچ گومانودوو دڵییەك روی تێ ناکاتوئیبراهیم ﷺ گەیشتە ئەو پلەیە ئینجا بۆ هەڵوەشاندنەوەی بت پەرستیوپیشاندانی رێگای لارو چەوتی گەلەکەی کەوتە رازو نیاز لە گەلیاندا وەك خوای دانا لێرەدا دەفەرموێ:

(٧٦) جا لە کاتێك دا کە شەو تاریك بو ئەستێرەیەکی دی لە ئاسمانوبە شێوەی گاڵتە کردن بە گەلەکەی وت: ئەوەیە خوای من؟ یان بۆ ئەوە بوە بێ دەنگیان بکات واتە : بە قسەی ئێوە ئەوە خوای منە؟ جاکاتێ کە ئەستێرەکە رۆیشتونەما وتی: من شتێك کە نەمێنێت خۆشم ناوێت مادام رۆی بە دەردم ناخوات.

(٧٧) جا کاتێك کە بینی مانگ هەڵهاتوشەوقی دایەوە وتی: ئەوە خوای منە؟ جاکاتێك کە مانگیش رۆیی وتی: ئەگەر پەروەردگارم رێنمایم نەکات منیش لە ریزی ئەم گەلە گومڕاهەدا دەبم، بەم شێوەیە تێی گەیاندن کە ئەو گەلە نەزانو گومڕاهن.

(٧٨) جا کاتێك کە خۆر(رۆژ)ی دی کە لە هەمو ئەستێرەکانی تر بە شەوق ترو پرشنگ دار تروگەورەترە دیسان وتی: ئەمە خوای منە؟جا ئەمیش کاتێك کە ئاوا بو ئیتر بووجی بۆ خۆشبوو وتی: ئەی گەلی من چاك گوێم لێ بگرنو بزانن کە بەبێگومان من بەریو دورم لەو هاوبەشیەی کە ئێوە دای دەنێن بۆ خوا.

(٧٩) بە راستی من روی خۆم خالیسانە کردە ئەو کەسەی کە ئاسمانانوزەوی دروستکردوەو من لە هاوەڵ دانەران نیم. وشەی"حنیفا" واتە دور کەوتنەوەو لادان لە هەمو بەتاڵێك و روکردنە راستوحەق) ئا بەو شێوەیە ئیبراهیم ﷺ بیروباوەڕی گەلەکەی هەڵوەشاندەوەو سەرچاوەی راستیو دروستی پێ ناساندن کە خوای تاكوتەنیایەو دروستکەری ئاسمانانو زەویە جا ئیتر گەلەکەی کەوتنە دەمە دەمە کردن لە گەلیدا :

(٨٠) وتی: ئێوە لە بارەی خواوە دەمە دەمەم لە گەلدا دەکەن لەحاڵێکدا کە ئەو منی رێنمایی کردوەو رێگای راستی پێشان داوم؟ جا من هەرگیز ناترسم لەو هاوبەشانەی کە ئێوە دای دەنێن بۆ خوا چونکە ناتوانن هیچم پێ بکەن کە نە قازانج دەگەیەننونە زیان مەگەر پەروەردگاری خۆم بیەوێت شتێك لە گەڵ مندا بکات واتە ئەگەر توشی شتێکیش ببم خوای خۆم کردویەتی نە بتەکانی ئێوە ، ئەمەی وت چونکە دەگونجێ خوا دوچاری سەختیەکی بکات لە بەر هەر سودێك کە خۆی دەزانێت تا ئەوان دوایی نەڵێن ئەوە دژایەتی خواکانی ئێمەی کرد بۆیە وای لێ هات وەك لەمڕۆدا ئەگەر بڵێیت نەسوڕێیتەوە بە دەوری قەبری کەساو سوجدە نە بۆ مردو نەبۆ زیندو نەبەیت چونکە شتێکی حەرامەودروست نیە جا ئەگەر کابرای ئامۆژگاری کەر توشی سەختیەك بو دەڵێن ئەوە دژی فلانە قەبر یان فلانە پیاو چاك بوە بۆیە وای لێ هاتوە نازانن ئەوە ئیشی خوایەو لەوانەیە خوا هەر بۆ ئەوە ئەو بەڵایە بە سەر ئەو ئامۆژگاری کەرەدا بدات تا هەم خۆیو هەم خەڵکیش تاقی بکرێنەوەو هیچی تر. جا قوڕ بە سەرت ئاگات لە خۆت بێو ئەو ئیشانەی کە تایبەتی خوایە نەیسپێریت بەکەسی تر ئەگەر بکرێت یانەکرێت هەربەدەست خوایە ماڵی خۆتت وێران کردوە . ئینجا قورئان دەفەرموێ: ئیبراهیم وتی: پەروەردگارم زانیاریەکانی هەمو شوێن دەگرێتەوەو شوێنێك نیە کەلە عیلمی ئەودا دەربچێت دەی ئیتر ئایا ئێوە بیر ناکەنەوە؟

(٨١) چۆن من دەترسم لەوەی کە ئێوە کردوتانە بە هاوبەش بۆ خوا لە حاڵێکدا ئێوە ناترسن لەوەی کە ئێوە هاوبەشتان بۆ خوا داناوە کە خوا بەڵگەیەکی بە هێزی لەو بارەوە نەناردوە بۆتانو هەر لە خۆتانەوە ئەم بت پەرستیتانە دروستکردوە دەی ئایا کۆمەڵێك کەبە گوێرەی فەرمانی خوا رەفتار بکاتو کۆمەڵێکیش دژی خوا بێت کامیان دەبێ کەم ترس ترو دڵنیاو ئارام تربێت ئەگەر ئێوە شت دەزانن؟.

(٨٢) ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو باوەڕەکەیان تێکەڵاو بە هاوبەش دانان نەکردوەو هیچ جۆرە هاوبەشێکیان بۆ خوا دانەناوە بۆ ئەوانە دڵنیاییو ئاسایش هەیەو هەر ئەوانەن کە رێگای هیدایەتیان گرتوە. کاتێ کە ئەم ئایەتە دابەزی یارەکانی پێغەمبەرﷺ وتیان: کێ هەیە لە ئێمە کە ستەمی نەکردبێت؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: { لَيْسَ كَمَا تَظُنُّونَ إِنَّمَا هُوَ كَمَا قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ ﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ ﴾ /منفق عليه/ وانیە کەئێوە گومان دەکەن ئەمە هەر وەك ئەوە وایە کە لوقمان بەکوڕەکەی وت: ﴿بە راستی هاوبەشی دانان بۆ خوا ستەمێکی گەورەیە﴾ . واتە مەبەستی ﴿ظُلم﴾ لەم ئایەتەدا هاوبەشی دانانە بۆ ﷲ.

(٨٣) ئا ئەوەیە بەڵگەی ئێمە کە دامان بە ئیبراهیم بۆ برینی بەهانەی گەلەکەی ، بەرز دەکەینەوە پلەی ئەو کەسانەی کە ئارەزۆمان لێ بێتو خۆی گونجاوو راستو دروست بێت لە خوا

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يَلۡبِسُوٓاْ إِيمَٰنَهُم بِظُلۡمٍ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلۡأَمۡنُ وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٨٢﴾ وَتِلۡكَ حُجَّتُنَآ ءَاتَيۡنَٰهَآ إِبۡرَٰهِيمَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦۚ نَرۡفَعُ دَرَجَٰتٖ مَّن نَّشَآءُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٨٣﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ إِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ كُلًّا هَدَيۡنَاۚ وَنُوحًا هَدَيۡنَا مِن قَبۡلُۖ وَمِن ذُرِّيَّتِهِۦ دَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ وَأَيُّوبَ وَيُوسُفَ وَمُوسَىٰ وَهَٰرُونَۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٤﴾ وَزَكَرِيَّا وَيَحۡيَىٰ وَعِيسَىٰ وَإِلۡيَاسَۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٥﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَيُونُسَ وَلُوطٗاۚ وَكُلّٗا فَضَّلۡنَا عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٦﴾ وَمِنۡ ءَابَآئِهِمۡ وَذُرِّيَّٰتِهِمۡ وَإِخۡوَٰنِهِمۡۖ وَٱجۡتَبَيۡنَٰهُمۡ وَهَدَيۡنَٰهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٨٧﴾ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَلَوۡ أَشۡرَكُواْ لَحَبِطَ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٨﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحُكۡمَ وَٱلنُّبُوَّةَۚ فَإِن يَكۡفُرۡ بِهَا هَٰٓؤُلَآءِ فَقَدۡ وَكَّلۡنَا بِهَا قَوۡمٗا لَّيۡسُواْ بِهَا بِكَٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقۡتَدِهۡۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٠﴾

ناسیولە پەیڕەوی کردنی ئایین دا چونکە خوا ستەم لە کەس ناکات هەر کەسێك بیەوێت بەرەو خوا بڕوات خوایش ڕێنمایی دەکاتوبە چەند بەرامبەری ئیشە چاکەکانی پاداشتی دەداتەوە چونکە بە ڕاستی خوای تۆ دانایە لە ئیشەکانی داو زانایە بە نیەتوئیشی خەڵك جا خۆزگە بەو کەسەی کە خوای داناو زانا یارمەتی دەداتو شارەزای دەکات چونکە لە گۆترەوە نیە. جا وا خوای گەورە پاداشتی ئیبراهیم ﷵ دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿٨٤﴾ جا ئێمە بە ئیبراهیم ، ئیسحاقو یەعقوبمان بەخشیو هەمومان ڕێنمای کردن چ ڕێنماییەك. ئەم دوو منداڵەی لە سارە خاتون کە کوڕو کوڕەزاینی لە پاش ئیسماعیل خوا پێی داوەو کردونی بە پێغەمبەر ، وە لە پێش ئەوانە دا نوحمان ڕێنمایی کردبوو کردومان بە پێغەمبەر ، وە لە نەوەی ئەویش ئێمە داودو سلیمانو ئەیوبو یوسفوموساو هارونی برای موسامان هەڵبژاردو هەر ئاوەها ئێمە پاداشتی چاکە کاران دەدەینەوە. ئیبراهیم ئەو مرۆڤە چاکە کارە بو کە کوڕی خۆی فیدای خوا کردو خوایش بەو شێوەیە پاداشتی دایەوە.

﴿٨٥﴾ ئەوسا هەر لە نەوەی ئەو بوون زەکەریاو یەحیاو عیسا وە ئەلیاس کە هەمویان لە پیاو چاکان بوون ، وە هەمویان پێغەمبەری خوا بوون.

﴿٨٦﴾ وەهەر لە نەوەی ئەو ئیسماعیل و یەسەع و یونس و لوتیشمان هەڵبژاردو هەمویانمان بەرز کردنەوەو ڕێزمان پێدان بە سەر عالەمدا.

بۆزانین: ئەمانە هەژدە پێغەمبەر بون کە لێرەدا باس کرانو لە تەواوی قورئان دا (٢٥) پێغەمبەر ناویان هاتوە کە حەوت ناوی تر بە شێوەی جیا جیا باس کراون لە قورئان دا کە ئەمانەن ( مد، إدريس، شعيب، صا ، هود، ذولكفل وآدم ،صلوات ا وسلامه عليهم أ ع ) ناکۆکی هەیە سەبارەت بە سێ کەس کە ئایا پێغەمبەرن یان نە؟ ( لُقمان و ذوالقَرَ و عُزَيْر ) ئەمانە ڕاستە کە بوونو هەر کەسێ ئینکاریان بکات کافر دەبێ بەڵام لە سەر ئەوەی کە پێغەمبەرن یان نە؟ کافر نابێت. باش وایە مرۆڤی باوەڕدار لێیان بێ دەنگ بێت.

﴿٨٧﴾ ئەوسا لە باوکانی ئەوانو لە نەوەکانیانو لە براکانیان هەڵمان بژاردنوکردمانن بە پێغەمبەرو ڕێنمایمان کردن بۆ سەر ڕێگای ڕاست. ئینجا خوای داناو زانا دەفەرموێ:

﴿٨٨﴾ ئا ئەوە ڕێنمایی خوایەو خوا ڕێنمایی دەکات بەو هیدایەتەی خۆی ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت. پێویستە لەم شوێنانەدا وریا بنوبزانن کە خوا زۆر، لە کەس ناکات ئەگەر کابرا خۆی ویستی ڕێگای خوا بگرێت خوایش کۆمەکی پێ دەکات ، وە ئەگەر کابرا ڕێگای گومڕاهی دەویست دیسان خوا بەویش کۆمەك دەکات. ئینجا دەفەرموێ: ئا ئەوانەی کە باسمان کردن لەوپێغەمبەرانە ئەگەر هاوبەشیان بۆ خوا دابنایە هەرچیانکردبو لەچاکەو خوا پەرستیو تەبلیغاتو زەحمەت کێشان لە سەر ئایینی خوا هەموی هەڵدەوەشایەوە جا با ئێمەیش سرنجی ئیشەکانی خۆمان بدەین نەوەك تێکەڵاوی شیرك بو بێت چونکە بەتاڵ دەبێتەوە خۆ ئێمە لەو پێغەمبەرانە نە گەورەترینو نە گرنگتر ین ، شیرك ئەوەندە جۆرێ هەیەو ئەوەندە بەنهێنی دزەدەکاتە ناودڵو دەرونو کردارەکانی خاوەن باوەڕانەوە پێغەمبەرمان ﷺ لێی ترساوەو هەمیشە پەنای دەگرت بەخوا لەوشیرکەی کە خۆی بزانێو لەوشیرکەیش کەخۆی پێی نەزانێ .

﴿٨٩﴾ ئەوانەی کە ئێمە باسمان کردن ئەوانە بوون کە ئێمە کتێبو فەرمانڕەوایی کردن بە سەر خەڵکداو پێغەمبەریمان پێ دان جا تەماشای نارەوایی قسەی ئەوانە بکە کە دەڵێن حەقتان چیە بە سەر خەڵکەوە بڕۆن بۆخۆتان نوێژ بکەنو ڕۆژو بگرنو زیکرو فیکری خۆتان بکەن ئیتر ئیشتان نەبێ بە سەر یاساو حکومەتەوە!! ئینجا ﷲ دەفەرموێ: جا ئەگەر ئەوان بێ باوەڕ دەبن بەوانەی کە باسکران لە کتێبوفەرمانڕەواییو

پێغەمبەرایەتی ئا ئەوانە (خەڵكی مەكە) بادڵنیا بن كە ئێمە گەلێكی ترمان داناوە بۆی ، كە بریتی بون لە كۆچەریەكانو یارمەتی دەرەكان ﴿المهاجرون والانصار﴾ كە ئەوان بێ باوەڕ نین بەو شتانەی كە باسكران، ئەوە بو لە پاشدا خەڵكی مەدینە زۆربەی هەرە زۆریان باوەڕیان هێناو لە گەل كۆچەرییەكاندا بون بە سەنگەرێكی بە هێزو قەلایەكی بتەو بۆ پێغەمبەرﷺ وئاینە تازەكەی (رەزاو رەحمەتی خوایان لێ بێت)وبون بە كۆڵەكەی یەكەم بۆبناغەی ئەم ئایینە بە نرخە.

(٩٠) ئا ئەمانەی كە باسكران لە پێغەمبەرانوباو باپیرو نەوەكانیانو براكانیان كەسانێك بون كە خوا رێنمایی كردون دەی تۆیش ئەی محمدﷺپەیڕەوی بكە لە رێنماییەكانی ئەوان، خۆ گەلەكەیشی پێویستە وەك خۆی بكەن. ئەی محمد ﷺبڵێ: من لە سەر ئەم راگەیاندنەو لە سەر بلاو كردنەوەی ئەم ئایینە داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناكەم، ئەو قورئانە بێجگە لەوەی كە ئامۆژگاری كەرێكی ئەم عالەمەیە شتێكی تر نیە كەواتە جێگای خۆیەتی كە ئێوە باش لەم ئایینە شارەزا بنوچاك پەیڕەوی لێوە بكەن چونكە هەموی ئامۆژگاریو رێ پێشاندانو رونكردنەوەیە بۆ هەمو خەڵك بەبێ جیاوازی لە نێوان رەنگو زمانو نەژاد دا، كەواتە خەیرو خۆشیە بۆ هەمو عالەم وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴾ الأنبياء: ١٠٧ بۆیە خوای داناو ئاگا تورەیە لەوانەی كە بە چاكی پە یڕەوی لەم ئایینە ناكەنودەفەرموێ:

(٩١) خۆ ئەوان رێزیان دانەناوە بۆ خوا بەو شێوەیەی كە پێویستو شیاوی مەقامی خوا بێت ئەو كاتەی كە وتیان: خوا هیچی رەوانە نەكردوە. پێیان بڵێ: ئەی كێ ئەو كتێبەی رەوانە كرد كە موسا هێنای؟ كە روناكیو رێ نیشاندەر بو بۆ خەڵك كە كردتان بە پەڕەگەلێكی كاغەز كە هەندێكتان ئاشكرا دەكردو زۆریشتان دەشاردەوە. وە فێری شتێك كران نە خۆتانو نە باوكانتان نەتان دەزانی؟ بڵێ: خوا ئەویشی رەوانە كردوە. لە پاش ئەو قسانە دەی لێیان گەڕێ با هەر لەو بێ ئاگاییەدا بنو با هەرگاڵتە بكەن بۆ كوێ دەچن؟ تۆ راسپاردەی خۆت راگەیەنە ئیتر وازیان لێ بێنە. ئابەم شێوەیە قورئان دەمكوتی ئەو جولەكانەی كرد، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٩٢) ئەوسا ئەمەی كەبۆ تۆمان ناردوە ئەی محمدﷺپەراوێكی پیرۆزەودان دەنێ بە راستی پەڕاوەكانی پێش خۆیدا، تا تۆ خەڵكی مەكەو ئەوانەی چوار دەوری بترسێنی بە سزای ﷲ ئەگەر پەیڕەوی ئایینەكەی نەكەن كە هەمو جیهان دەگرێتەوە چونكە

وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ قُلۡ مَنۡ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِي جَآءَ بِهِۦ مُوسَىٰ نُورٗا وَهُدٗى لِّلنَّاسِۖ تَجۡعَلُونَهُۥ قَرَاطِيسَ تُبۡدُونَهَا وَتُخۡفُونَ كَثِيرٗاۖ وَعُلِّمۡتُم مَّا لَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنتُمۡ وَلَآ ءَابَآؤُكُمۡۖ قُلِ ٱللَّهُۖ ثُمَّ ذَرۡهُمۡ فِي خَوۡضِهِمۡ يَلۡعَبُونَ ﴿٩١﴾ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ مُّصَدِّقُ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَلِتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَاۚ وَٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَهُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴿٩٢﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ قَالَ أُوحِيَ إِلَيَّ وَلَمۡ يُوحَ إِلَيۡهِ شَيۡءٞ وَمَن قَالَ سَأُنزِلُ مِثۡلَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۗ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ وَكُنتُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهِۦ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٩٣﴾ وَلَقَدۡ جِئۡتُمُونَا فُرَٰدَىٰ كَمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَتَرَكۡتُم مَّا خَوَّلۡنَٰكُمۡ وَرَآءَ ظُهُورِكُمۡۖ وَمَا نَرَىٰ مَعَكُمۡ شُفَعَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُمۡ أَنَّهُمۡ فِيكُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْۚ لَقَد تَّقَطَّعَ بَيۡنَكُمۡ وَضَلَّ عَنكُم مَّا كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٩٤﴾

هەمو دنیا بریتیە لە مەكەوچوار دەوری مەكە، ئینجا خوا دەفەرموێ: وە ئەو كەسانەی كە باوەڕیان بە رۆژی قیامەت هەیە باوەڕیش بەم قورئانە دەكەن لە حاڵێكدا كەئەوان پارێزگاری نوێژەكانیان دەكەنو لە كاتی خۆیاندا جێ بە جێی دەكەنو كەمتەر خەمیو بێ موبالاتی تێدا ناكەن لە ئەنجام دانیان دا. پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: {أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُن أَحَدٌ قَبْلِي...وَكَانَ النبي يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصةً وَبُعِثْتُ إِلَى الناس عَامَةً/منفق عليه/ من پێنج شتم پێدراوە كەنەدراوەبەهیچ پێغەمبەرێكی تر پێش من. لەو پێنج شتە ئەمەی باسكرد كە "هەر پێغەمبەرێك تایبەت بوە بۆ گەلەكەی خۆی بەلاَم من نێرراوم بۆ هەمو خەڵك".

(٩٣) كێ هەیە لەو كەسە ستەمكارتر كە درۆ بە دەمی خواوە بكات یان بڵێ: وەحی كراوەتە لای من لەحاڵێكدا هیچی شی بۆ نەهات بێت؟ وەستەمكار تر لەو كەسەی كە بڵێ: منیش بەم زوانە شتی ئاوەها دێنم وەك ئەوەی كە خوا ناردویەتی بۆ محمدﷺ جا خوا دەفەرموێ: ئەگەر تۆ ببینی ئەو كاتەی كە ستەمكاران كە دەچنە ناو دەریای مەرگەوەولە هەمو شت نائۆمێد دەبنو كەس فریایان ناكەوێتو فریشتەكانیش دەست رادەكێشن بۆیانولێیان دەدەنودەڵێن: دەری بكەن گیانەكانتان بۆ تۆڵەو سزای خوا ئا ئەمرۆ جەزا دەدرێنەوە بە سزایەك كە گاڵتەكەرە پێتان وەك چۆن ئێوە لە دنیادا گاڵتەتان دەكرد بە پێغەمبەرو ئایینوخاوەن

﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَالِقُ ٱلۡحَبِّ وَٱلنَّوَىٰۖ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَمُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتِ مِنَ ٱلۡحَيِّۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ (٩٥) فَالِقُ ٱلۡإِصۡبَاحِ وَجَعَلَ ٱلَّيۡلَ سَكَنٗا وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ حُسۡبَانٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ (٩٦) وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ (٩٧) وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنشَأَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ فَمُسۡتَقَرّٞ وَمُسۡتَوۡدَعٞۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ (٩٨) وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦ نَبَاتَ كُلِّ شَيۡءٖ فَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهُ خَضِرٗا نُّخۡرِجُ مِنۡهُ حَبّٗا مُّتَرَاكِبٗا وَمِنَ ٱلنَّخۡلِ مِن طَلۡعِهَا قِنۡوَانٞ دَانِيَةٞ وَجَنَّٰتٖ مِّنۡ أَعۡنَابٖ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُشۡتَبِهٗا وَغَيۡرَ مُتَشَٰبِهٍۗ ٱنظُرُوٓاْ إِلَىٰ ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثۡمَرَ وَيَنۡعِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكُمۡ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ (٩٩) وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلۡجِنَّ وَخَلَقَهُمۡۖ وَخَرَقُواْ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَٰتِۢ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ (١٠٠) بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ صَٰحِبَةٞۖ وَخَلَقَ كُلَّ شَيۡءٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ (١٠١)﴾

باوەڕان ئەم سزایەش بە هۆی ئەوەیە کە ئێوە قسەی نادروستوناڕەواتان بە دەم خواوە دەگوتودەتان وت: خوا هیچی رەوانە نەکردووەو بە هۆی ئەوەی کە خۆتان زۆر بە گەورە گرتو مل پێچیتان کرد لەبڕیارەکانی پێغەمبەرﷺو لە ئایین ، جا وا ئەمڕۆ بەو سزایە خوا سووكو رسواتان دەکات. ئینجاخوا سرنجی هەمو خەڵك بە تایبەت بێ باوەڕان رادەکێشێ بۆ بیر کردنەوە لە هاتنی دوا رۆژوو دەفەرموێ:

(٩٤) بەراستی ئێوە دێن بۆ لای ئێمە بە تاكو تەنیایی چۆن لە سەرەتاوە لە دایکتان بە تاكوتەنیایی دروستمان کردنو هیچ توانایيەکتان نەبو روتوقوت بون هەر ئاوها بە روتیوبەو شێوەیە دێنەوە بۆ لای ئێمە بۆ دادگایی کردنتان، نەماڵونە منداڵونە شورەتونە مەقام نە قەسرو نە تەلارو نە هێزو نە سوپات لە گەڵتا نابێت بەڵكو بە تەنهایی دەچیت بۆ بەردەم دادگای ﷻ وئەوەی کە پێمان داون لە شورەتو سامانو ماڵو مەقامو کەسو کارو موڵك هەموتان بە جێ هێشتو ئێمەنابینین ئەو پاڵپشتوشافیعانەش کە واتان دەزانی لە رۆژی قیامەتدا شەفاعەتتان بۆ دەکەن لە گەل ئێوەدابن، بە دڵنیایەوە بچرا ئەو پەیوەندیەی کە لە نێوانتاندا بو ئەوەی کە گومانتان پێ دەبردن کە لە دنیاو دوا رۆژدا بێن بە هاوارتانەوەو تکاتان بۆ بکەن وا ئەمڕۆڵێتان ون بوون. ئینجا ﷻ هەندێك لە گەورەیيو هێزی خۆی پیشان ئەداتودەفەرموێ:

(٩٥) بێگومان کە خوا دانەو ناوکەکان شەق دەکاتو لەو دنکە بچکۆلانە ئەو هەمو گیاوو درەختو بەروبومە جوانانە دەداتو شینایی وئەو درەختە گەورانە دەڕوێنیو زیندو لە مردو دەر دەهێنێت، تەماشاکە لەو زەویە رەقو وشکە ئەو سەوزەو میوە دروست دەکاتوئەو زیندو لەو مردوە دەردەهێنێتو دەردەهێنێ مردوش لە زیندو لەو درەختە زیندوە تۆو دروست دەبێت کە مردوە یان لە مرۆڤ کە زیندوە تۆو ﴿نطفة﴾ دروست دەبێت یان لە مریشك هێلکە دروست دەبێت، واتە: لەو زیندوانە مردویان لێ دروست دەبێت ئەوە خوایە کە ئەوانە دەکات ئیتر ئێوە چۆن لەوراستیە لادەدرێن؟! دەی بیربکەنەوەو واز لەوگوفتارو رەفتارە پیسوناپاکانە بهێنن. ئینجا دەفەرموێ:

(٩٦) رۆژ لە شەو جیا دەکاتەوەو سشەویشی داناوە بۆ ئارامگرتن کە مرۆڤ تێیدا بحەسێتەوەو رۆژو مانگیشی داناوە بۆ حیساب کردن ، چونکە بە هۆی رۆژەوە مانگ دەبینرێتوبە کەمو زیادی مانگیش ژمارە دەزانرێت ئەوە ئەندازەگیری خوایەکی خاوەن دەسەڵاتو زانایەو شتێکی گۆترە نیە. جا ئەگەر مانگ وەك رۆژ هەر یەك شێوە بوایە زانینی ژمارە بۆ گەلێکی نەخوێندەوار زۆر سەختودژوار دەبو.

(٩٧) جا هەر ئەو زاتەیە کە ئەستێرەکانی داناوەبۆ ئێوە تا رێگەی پێ بدۆزنەوە لە تاریکاییەکانی وشکاییو دەریایەکان دا بە تایبەتی ئەمڕۆ حیکمەتی سرنج راکێشی ئەم ئایەتە دەر دەکەوێ کە لەو دەریا گەورانەدا ئەو کەشتیانە چەند شەووڕۆژ دەڕۆن تا دەگەنە جێگای مەبەست ، جا ئەگەر بە هۆی ئەستێرەکانەوە نەبێت نازانن بەرەو کوێ دەچن کەواتە خوای گەورە ئەم ئەستێرانەی بۆ سێ شت داناوە. یەکەم : بۆ جوان کردنی ئاسمانی نزیك لە خۆمانەوە وەك لە سورەتی (الملك: ٥) دا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ﴾ . دووهەم : لە هەمان سورەتدا دەفەرموێ: ﴿وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِ﴾ بۆ ئەوە دامان ناوە کە شەیتانەکان بەرد باران بکرێنو نەهێڵن نزیك ببنەوە لە ئاسمانەوەو هەواڵ بگەیەننە خوارەوە. سێهەم : وەك لێرەدا فەرموی تا رێگای پێ بدۆزنەوە لە شەوی تاریکداو بزانن بۆ کوێ دەچن چ راستەو خۆ بە هۆی ئەستێرەکانەوە بێ یان بە هۆی قیبلەنماکانەوە بێت، ئینجا دەفەرموێ: بە حەقیقەت ئێمە درێژە دەدەین بە رۆشن کردنەوەی نیشانەکانی خۆمان بۆ ئەو گەلەی کە زانایەو بتوانێت پەی بە راستیەکان ببات. ئینجا زیاتر درێژە بە باسی دەسەڵاتوهێزی خۆی دەداتو دەفەرموێ:

ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ فَٱعْبُدُوهُ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٠٢﴾ لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ قَدْ جَآءَكُم بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَنْ أَبْصَرَ فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ عَمِىَ فَعَلَيْهَا ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿١٠٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلْءَايَٰتِ وَلِيَقُولُوا۟ دَرَسْتَ وَلِنُبَيِّنَهُۥ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿١٠٥﴾ ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكُوا۟ ۗ وَمَا جَعَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٧﴾ وَلَا تَسُبُّوا۟ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَسُبُّوا۟ ٱللَّهَ عَدْوًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ كَذَٰلِكَ زَيَّنَّا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِم مَّرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٠٨﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَتْهُمْ ءَايَةٌ لَّيُؤْمِنُنَّ بِهَا ۚ قُلْ إِنَّمَا ٱلْءَايَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَا يُشْعِرُكُمْ أَنَّهَآ إِذَا جَآءَتْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠٩﴾ وَنُقَلِّبُ أَفْـِٔدَتَهُمْ وَأَبْصَٰرَهُمْ كَمَا لَمْ يُؤْمِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَنَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١١٠﴾

(٩٨) جا خۆی ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروستکردوە لە یەك کەس کە ئادەمە ، ئینجا بۆ ئێوە هەیە جێگای ئارام گرتنو جێگای بەئەمانەت دانان، ئەم دوو وشەیە بە چەندین مانا راڤە کراوە من وای بۆ دەچم کە بۆ ئێوە هەیە شوێنی ئارام گرتن کە رەحمی دایکەوکەم کەم شێوەی دنیایی لێ ئەڕوێتولە پاشا دێتە دنیاوپاش ماوەیەك لە دنیا دەردەچێتو بە ئەمانەت دەخرێتە گۆڕەوە کە کەم کەم شێوەی دوا رۆژی لێ دەردەکەوێت کە زیندوو بونەوەوحیسابە پاشان بەهەشتو جەهەننەمە هەر چەند ئەمەیشم بەلاوە دوور نیە کە بڵێین خوا دەفەرموێ: لە پاش ئەوەی کە ئێوەم لە ئادەم دروستکرد دوو جێگاتان هەیە یەکێکیان مانەوەیە بۆ هەمیشە کە بەهەشتو جەهەننەمەو ئەویتریان ئەمانەتە چ رەحمەوچ ژیانی دنیاو چ گۆڕ بێت والله اعلم، جا چونکە ئەم باسە باسێکی وردە لە پاشدا ئەفەرموی: بە حەقیقەت ئێمە درێژەمان داوە بە رۆشنکردنەوەی نیشانەکانمان بۆ گەلێك کە زاناو زیرەكو فامیدە بێت بەڵێ زانای زیرەكو فامیدەدەتوانێ لە بارەی دروستبونی ئەم مرۆڤە رێكوپێكو خاوەن هەستو فامیدە لە ئاوێکی سادەی وا کە کابرا ئەگەر بر شنگێکی لێ بکەوێت حەز ناکات کەس بیبینێو زوو خۆی لێ پاك دەکاتەوە ، جا ئەگەر زانایەکی زیرەكو فامیدە نەبێت ئەمانە نازانێت :

(٩٩) ئەوسا خۆی ئەو کەسەیە کە لە ئاسمانەوە ئاو رەوانە دەکات بەو شێوە گرنگە کە دەیبینین، ئینجا بەو ئاوە دەردەهێنین گیایی هەمو شتێك، پێشەکی هەمو شیناىو درەختێك گیایەکی ناسکی بچوکەو بە هۆی ئاوەوە سەوز دەبێت ، جا لەو گیایە شینایمان دەرهێناو لەو شینایيەش دانەی سوار بو لە سەر یەکمان دەرهێناو لە دار خورما لەو کیسەی کە لێی دەڕوێت هێشوی شۆڕ بوە بە هۆی قورسیەوە دەرهێناوەو چەندین باخچە لە ترێو زەیتونو هەناری لەیەکچوو لە یەك نەچومان رواندوە ، با تەماشای بەروبومەکەی بکەن کاتێك کە بەر ئەداتو کاتێ کە پێ دەگات چەند جیان لەیەك لە تامو رەنگو شێوازەوە لە سەرەتاوە تا پێ دەگات، کێ ئەم گۆڕانکارییەی پێ دەکات؟ بێگومان لەوانەی کە باسمان کردن چەندین بەڵگە هەیە لە سەر هێزو دانایىو زانایی خوا بۆ گەلێك کە باوەڕ بهێنن. ئینجا ﷲ باسی ناسوپاسىو نەزانی زۆربەی مرۆڤ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٠٠) لە گەل ئەوەدا چەندین هاوبەشیان داناوە بۆ خوا کە هەندێکیان جنۆکەن کە خوا دروستی کردونو بە ناڕەوا کوڕانوکچان دا دەنێن بۆ خوا بە بێ ئەوەی کە هیچ زانایيەکیان لەم بارەوە هەبێت، ئەوەتە گاور دەڵێن: " عیسا کوڕی خوایە"و جویش دەڵێن:" عوزەیر کوڕی خوایە"و بت پەرستانیش دەڵێن: "فریشتەکان کچی خودان" خوا زۆر بەرزو پاكو بێ نیازە لەو وەسفەی کە ئەوان دەیکەن. خوا ئاسمانانو زەویو هەمو شتەکانی ناویانی دروست کردوە چ نیازێکی هەیە بە منداڵو بە هاوسەر؟ جا پێویستە لە سەر ئێمە هەروەك خۆی دەفەرموێ: ئێمەیش بڵێین: "**سبحانە وتعا عما یصفون**/ پاكو بێگەردە خواو بەرزە لەو سیفەتانەی کە ئەوان بۆ خوای دادەنێن".

(١٠١) بەدی هێنەری ئاسمانانو زەویە، چۆن دەبێ کوڕی ببێت کە ئەو خێزانی نیە چونکە منداڵ وبەچکە دەبێ لە دوو شتی لە یەك چوو هاوشانی یەكومناسبی یەکتر بن دەی خۆ کەس هاوشانو هاو شێوەی خوا نیەو لەو ناچێت ، ئیتر چۆن دەبێ بڵێین خوا ئەولادی هەیە؟ لەحاڵێکدا کەئەو هەمو شتێکی دروستکردوە، مادام هەموی دروستکراوی ئەو بێت ئیتر چ نیازێکی بەو دروستکراوەی خۆی هەیە؟ وە ئەو زانیاری بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

(١٠٢) ئەو (ﷲ) یە پەروەردگاری ئێوەیەکە هیچ خوایەکی تر نیەو پەرستراوێکی راستەقینەی تر نیە بێجگە لە ئەو کەدروستکەری هەمو شتێکە، دەی بی پەرستن خۆ ئەو چاودێرو پارێزەری هەمو شتێکە.

(١٠٣) دیدەکان ناتوانن ئەو ببینن بەڵام ئەو دەتوانی هەمو دیدەکان ببینێو حەقیقەتیان بزانێ چونکە خۆی دروستیان

دەكات ، وە هەر ئەوە زۆر ریز بینو وردبینو بەئاگایە. جا لەم ئایەتەدا كە خوا دەفەرموێ:﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ چاو دەركی ناكات ، هەندێك ئەمە دەكەن بە بەلگە لە سەر ئەوەی كە مرۆڤ خوا نابینێت بەڵێ راستە لە دنیادا مرۆڤ ناتوانێ خوا ببینێت، بەڵام لە قیامەت دا دەتوانێ وەك لە سورەتی (القیامه) دا دەفەرموێ: ﴿ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ﴿٢٣﴾ ﴾ ڕوودەم وچاوانێكی زۆرن كە لە رۆژی قیامەتدا دەدرەوشێنەوە چونكە تەماشای خوای خۆیان دەكەن﴾، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: { إِنَّكُمْ سَتَرَوْنَ رَبَّكُمْ كَمَا تَرَوْنَ هَذَا الْقَمَرَ /متفق علیه/ بێگومان بەم زوانە خوای خۆتان لە رۆژی قیامەتدا دەبینن وەك چۆن ئائەم مانگی چواردەیە دەبینن لە دنیادا} جا ئەوانەی كە ئینكاری بینینی خوا دەكەن لە قیامەتدا بە هەڵە دا چوون بەڵام لە دنیادا نایبینین نەك لە بەر مانای ئەم ئایەتە بەڵكو بە گوێرەی ئایەتی ﴿ لَن تَرَىٰنِي ﴾ الأعراف: ١٤٣ / ناتوانی بم بینی، بۆیە دەڵێم لە بەر مانای ئەم ئایەتە نە، چونكە من بەم شێوەیە لە مانای ئەم ئایەتە تێ دەگەم كە ﷲ دەفەرموێ: ﴿ لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ ﴾ واتە دیدەكان دەركی واقعیەتی ناكەن دەرك كردن غەیری بینینە تۆ دەگونجێ شتێك ببینی بەڵام نەزانی حەقیقەتەكەی چۆنە ئێمە خوا دەبینین لە قیامەتدا بەڵام دەگونجێ دەركی حەقیقەتی نەكەین بەڵام خوا هەمو دیدەكان دەبینێو حەقیقەتیان دەزانێ چونكە خۆی دروستی كردونو دەیان پارێزێ. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

﴿١٠٤﴾ ئەی ئەو كەسانەی كە قورئان قسەتان لە گەڵدا دەكات بە راستی هاتوتە لاتان چەندین بەڵگەی رۆشنكەرەوە لە لایەن پەروەردگاری خۆتانەوە ، ئەو بەڵگانە وەك دوربینن چۆن كاتێك چاو شتێك نابینێت ، بەڵام كە دوربین لە چاو دەكات دەزانێ چیەو دەیان بینێ، جا ئەو كەسەی كە چاو بكاتەوەو سود لەو بەڵگانە وەربگرێتوباش لێی وردببێتەوە سودەكەی بۆ خۆیەتیو ئەو كەسەش كە خۆی كوێر بكاتوئەو هەمو بەڵگانە نەبینێ زیانی بە خۆی گەیاندوە ، جا ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: من حەرەسوچاودێری ئێوە نیم كە نەیەڵم ئێوە بەم لاو بەو لادا بڕۆنو لە هەموشت بتان پارێزم.

﴿١٠٥﴾ جا وا ئایاتەكانی خۆمان دەگۆڕینوشی دەكەینەوە بۆیان، وە ئەوان با بڵێن: تۆ ئەمانەت خوێندوە ، كاتێ كە پێغەمبەرمانﷺ ئەمانەی باس دەكرد خەڵكی مەكە ، چونكە خۆیان نەخوێندەوار بونو شتی وایان نەدەزانی دەیان وت: تۆ ئەمانەت لە لای جولەكەو گاورەكان خوێندوەو فێری بویتو بۆ ئێمەی باس دەكەیت ، ئیتر بیریان لەوە نەدەكردەوە كە ئەم شەخسە هەر لە منداڵیەوە تا بەم تەمەنە گەیشتوە هیچی نەخوێندوەوهەمیشەش لە بەر چاویان بوە، ئیتر چۆن هەروا بە چاو پێ كەوتنێك دەتوانێت ئەم هەمو شتە گرنگانە بزانێت؟ هەروەها دەفەرموێ: سوێند بە گەورەیی خۆم راستیوناراستی بۆ گەلێك كە بیانەوێ بزانن رۆشن دەكەینەوە تا پەیرەوی راستیەكان بكەنودوور بكەونەوە لە خراپەو ناراستیەكان. بەراستی قورئان بەیانە بۆ هەمو كەسێك بەڵام زانایان سودی لێ وەردەگرن ، لەبەر ئەوە دەفەرموێ: بۆ ئەوانەی كە بیانەوێ بزانن وەك لە سورەتی (فاتیر /٢٨) دا دەفەرموێت:﴿ لەناوبەندەكانی ﷲ دا هەرزانایانن كە لەخوادەترسن﴾ زاناش واتە ئەهلی تەوحیدو یەكخواناسی بێجگە لەوانە كەس بە زانا دانانرێت ، چونكە هەر خۆیان لە رۆژی قیامەتدا دان دەنێن بە نەزانی خۆیاندا وەك لە سورەتی (الملك/١٠) دا دەفەرموێ: ﴿ خوانەناسان دەڵێن: ئەگەر ئێمە بمان بیستایەوژیریمان كاری بكردایە ئێستا لەم ئاگرە داخەدا نەدەبوین﴾ واتە دان بە بێ عەقڵی خۆیان دا دەنێن. وشەی (دَرَسۡتَ ) بە (دارَسْتَ)ش خوێندراوەتەوە. ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٠٦﴾ ئەی محمدﷺ تۆ پەیرەوی ئەوە بكە كە لە لایەن پەروەردگارتەوە پێت گەیشتوە كە قورئانەو هیچ پەرستراوێكی راستەقینەی تر نیە بێجگە لە ئەوو پشت بكەرە ئەوو هاوەڵدانەرانە بۆ ئەو پەروەردگارە یەكتایەو گوێیان پێ مەدە. ئەمە بەر لە فەرز بونی جیهاد بوە، ئینجا خوا دڵخۆشی پێغەمبەرمان دەكاتودەفەرموێ:

﴿١٠٧﴾ئەوسا ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بوایە ئەوان هاوبەشیان دانەدەنا بۆ خوا بەڵام زۆری لێ نەكردونوخۆیانی كردوە بە سەر پشك ئەوانیش لە باتی یەكتا پەرستی هاوەڵیان بۆ داناوە كەواتە تۆ نارەحەت مەبەو تۆمان دانەناوە كە چاودێرو پاسەبانی ئەوان بیت كەنەهێڵی بەهەڵەدا برۆن ، وە تۆ وەكیلو زامنی ئەوان نیت بۆ رزقو رۆزیو كارو باریان ، تۆ تەنها گەیاندنو رۆشن كردنەوەت لە سەرە وەك لە سورەتی رەعددا دەفەرموێ: ﴿لە سەر تۆ تەنها گەیاندنە، خۆ لە سەر ئێمەیە حیساب كردن﴾
دەڵێن كاتێ كەئەبو تالب كەوتە سەرە مەرگ قورەیشیەكان وتیان: وەرن با بچینە لای ئەو پیاوەو پێی بڵێین: برازاكەت بەرگری بكە لە قسە وتن پێمان ، چونكە ناشیرینە دوای مردنی بیكوژینو عەرەب بڵێ: تا مامی مابو پارێزگاری لێ كرد وەختێ كە مرد كوشتیان ، جا بۆ ئەو مەبەستە ئەبو سوفیانو ئەبو جەهلو نەزری كوڕی حاریسو ئومیەو ئۆبەیەی كوڕانی خەلەفوعوقبەی كوڕی ئەبو موعەیتو عەمری كوڕی عاسو ئەسوەدی كوڕی

بەختەری یەکێکیان لە خۆیان ناردە لای ئەبو تالیب کە ماوەیان بدات بچنە لای ، ئەویش هاتە لای ئەبو تالیبو وتی: ئەوە ریش سپیانی گەلەکەتن دەیانەوێ بێنە لات، ئەویش ماوەی پێدانوهاتنە لایو وتیان: ئەی ئەبو تالب تۆ گەورەی ئێمەو ریش سپی ئێمەیت بە راستی محمد ئازاری خۆمانوخواکانی داوین پێمان خۆشە بانگی بکەیتوبلێیت: وازبێنێ لە باس کردنی خواکانی ئێمەو ئێمەش واز لەئەوو لە خواکەی دێنین، ئەبو تالبیش بانگی کردو وتی: ئائەوانە گەلی تۆنو ئامۆزاتن پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: چیان دەوێ؟ ئەویش قسەکەی ئەوانی پێ وت، وتی: گەلەکەت بە ویژدان بونوتۆیش وەری گرە لێیان، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەگەر من ئەوەتان پێ بدەم ئێوەش کەلیمەیەك لە من وەردەگرن ئەگەر بڵێن: بەڵێو وەری بگرن دەبن بە گەورەی عەرەبو غەیرە عەرەبیش گەردن کەچ دەبێت بۆتانو سەرانەتان پێ دەدات؟ ئەبو جەهل سوێندی بۆ خواردو وتی: دە ئەوەندەش لە تۆ وەردەگرین، ئەوە چیە؟ فەرموی بڵێن: ( لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ) هەر کە بیستیان نارەحەت بونو وەقرەیان نەگرتو ئەبو تالب وتی: شتێ تریان پێ بڵێ گەلەکەت زۆر تورەن لەوە! فەرموی: ئەی مامی خۆم من بێجگە لەوە شتێکی تر نالێم هەتا رۆژ نەهێننوداینێن لە دەستمدا وە ئەگەر رۆژیش بهێننوداینێن لە دەستمدا من بێجگە لەوە شتێکی تر نالێم . بەم شێوەیە ویستی کە نائۆمێدیان بکات جائەوانیش رقیان هەستاو وتیان: یان دەبێ وازبێنی لە جنێو دان بە خواکانمان یان ئێمەش جنێو دەدەین بە تۆوبەو کەسەیش کە فەرمانت بە سەردا دەدات، ئەمەیە مەبەستی ئەم ئایەتە کە دەفەرموێ: جائەوان جنێو بە خوا دەدەن کوێرانەو بێ ئەوەی هیچ شت بزانن قەتادە دەڵێ: موسڵمانەکان جنێویان دەدا بە بتانی بێ باوەڕانو ئەوانیش دوژمنانەو بێ زانایی جنێویان بە خوا ئەداوخوایش ئەم ئایەتەی رەوانە کرد.

(١٠٨) جا ئێوە جنێو بەو کەسانە مەدەن کە بێجگە لەخوا دەپەرستن ، چونکە ئەوانیش جنێو بە خوای ئێوە دەدەن بە بێ ئەدەبیو بە نەفامی ئەو کاتە تاوان دەکەوێتە سەر ئێوە. وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {گەورەترین گوناح ئەوەیە کە مرۆڤ جنێو بە دایكو باوکی خۆی بداتو لەعنەتیان لێ بکات. یارەکان وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا کێ هەیە لەعنەت لە دایكو باوکی خۆی بکات؟ فەرموی: جنێو بە باوکی کابرا دەدات ئەویش جنێو بە باوکی ئەو دەداتو جنێو بە دایکی کابرا دەدات ئەویش جنێو بە دایکی ئەو دەدات کەوابو خۆی بوبە هۆی جنێودان بە باوكودایکی}

واتە: پێویستە لە سەر بانگەواز کەرانی ئایین لە کاتی قسە کردن لە گەل دوژمنانی ئاییندا جنێو بەو شتانەی لای ئەوان پیرۆزە نەدات ئەگەر چی شتێکی خراپەو پێویستە بە خەڵکی بناسێنرێت ، چونکە لەو کاتەدا ئەوانیش رقیان هەڵدەستێتو لەوانەیە قسەی خراپ بە خواو بە ئایینو بە پێغەمبەرﷺ بڵێن: واتە پێویستە ئەو جنێوە لەو کاتەدا وازی لێ بێنێ لە بەر بەرژەوەندی ئایین، چونکە هەر کەسێك بیروباوەڕی خۆی بەلاوە جوانە وەك دەفەرموێ: جا هەر ئاوەها ئێمە جوانمان کردوە بۆ هەمو گەلێك کردەوەکەی خۆی ، واتە: هەر کەسێك کردەوەکەی خۆی پێ چاکە لە پاشان بۆ لای پەروەردگاری خۆیان دەگەڕێنەوە ، ئینجا خوا هەواڵی کارو کۆششەکانیان پێ دەداتو تێیان دەگەیەنێ کە چیان کردوە بەڵام خۆ ئەوان کوڕە دەمارەکەی دنیا نین بەڵکو لەوێ لە ترسا دەڵێن: هیچ ئیشێکی خراپمان نەکردوە.

(١٠٩) خۆ ئەوسا ئەوانە سوێند دەخۆن بە سوێندێکی زۆر توندو گەورەو دەڵێن: ئەگەر نیشانەیەك لەوانەی کە داوای دەکەن بێت بێگومان باوەڕی پێ دێنین بڵێ: ئایات وموعجیزات بە دەستی خوایە وبە دەستی من نیە ، بەڵام ئێوە نازانن ئەگەر ئەو داواکاریەی خۆیانیان بۆ بهاتایە ئەوان هەر باوەڕیان نە دەهێنا ، وە دەگونجێ مانای ئاوەها بێت بێ باوەڕان سوێندی پتەو دەخۆن بە خواو دەڵێن: ئەگەر ئەو داخوازیانەیان بهاتایەتە دی باوەڕیان دەهێنا بەو، خوای گەورەش دەفەرموێ: ئەی محمد پێیان بڵێ: جێ بە جێ کردنی داواکاری ئێوە تەنها بە دەست خوایەو خاوەن باوەڕان پێیان خۆشبو داواکاری بێ باوەڕان جێ بە جێ بکرایە بەڵکو باوەڕ بهێنن خوایش دەفەرموێ: ئێوە نازانن ئەگەر ئەو داواخوازیانەشیان بۆ جێبەجێ بکرایە هەر باوەڕیان نەدەهێنا ، یان بە چی دەزانن ئەگەر جێ بە جێ بکرایە بۆیان باوەڕیان دەهێناو لەم حاڵەتەدا (لَا) لە وشەی ﴿لَا يُؤْمِنُونَ﴾ زیادەیەو پێ ی دەوترێت (لَا)ی پەیوەندی، لێرەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە نابێ داخوازی بێ باوەڕان جێ بە جێ بکرێتو موسڵمان بۆ خاتری ئەوان چاوپۆشی لە هەندێ یاساوبڕیاری خوا بکات بە ناوی بەرژەوەندیەوە. ئینجا دەفەرموێ:

(١١٠) جا هەر ئاوەها ئێمە دڵەکانیانو چاوەکانیان دەگۆڕین هەروەك چۆن لەسەرەتاوە باوەڕیان نەهێنا هەروا لە سەر بێ باوەڕیو خراپی دەیان هێڵینەوەو وازیان لێ دەهێنین تا بە تەواوی بە هۆی سەرکەشیولە خۆبایی بونیانەوە سەرگەردانو سەرلێشێواو دەبن،

وَلَوۡ أَنَّنَا نَزَّلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَحَشَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ كُلَّ شَيۡءٖ قُبُلٗا مَّا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُوٓاْ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ يَجۡهَلُونَ ﴿١١١﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصۡغَىٰٓ إِلَيۡهِ أَفۡـِٔدَةُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ وَلِيَرۡضَوۡهُ وَلِيَقۡتَرِفُواْ مَا هُم مُّقۡتَرِفُونَ ﴿١١٣﴾ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَبۡتَغِي حَكَمٗا وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكِتَٰبَ مُفَصَّلٗاۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَعۡلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٞ مِّن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُمۡتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ وَإِن تُطِعۡ أَكۡثَرَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿١١٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ مَن يَضِلُّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١١٧﴾ فَكُلُواْ مِمَّا ذُكِرَ ٱسۡمُ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ إِن كُنتُم بِـَٔايَٰتِهِۦ مُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾

﴿١١١﴾ خۆ ئەگەر ئێمە فریشتەکانمان ڕەوانە بکردایە بۆ لایانو مردووەکان زیندو ببنەوەوقسەیان لە گەڵدا بکەن و هەرچی شتێك هەیە کۆمان بکردایەوە بۆیان بە چاوی خۆیان بیان بینایە ئەوان هەر باوەڕیان نەدەهێنا مەگەر خوا ئارەزۆی لێبوایە ، ئاشکرایە خوایش دنیای بۆ تاقیکردنەوە دروست کردوە نە کەس بە زۆر باوەڕدار دەکاتونە کەسیش بەزور بێ باوەڕ دەکات ، بەلام زۆربەی ئەوان نەزانانە دەجولێنەوەو پێیان وایە ئێمە ئاگامان لێیان نیەونازانین دەیانەوێت چی بکەنوچیان دەوێ ، جا ﷻ بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:

﴿١١٢﴾ وەك چۆن ئێستا دوژمنانێك بۆ تۆ هەنو دوژمنایەتیت دەکەن هەرئاوەها بۆ هەمو پێغەمبەرێك دوژمنمان داناوە لە شەیتانو شەیتان سیفەتانی مرۆڤوجنۆکە ، کە نیگا دەکەنە لای یەکتریو هەواڵ دێنن بۆ یەکتری بە قسەی زلو بریقە دار بۆ فریودانی خەڵکی هەردوو بەشەکە، واتە: هەر کەسێك بەرنامەیەکی وا ڕاستی بۆ هاتبێ هەمیشە دوژمنایەتی کراوەو ڕەوشتی خوا وایە لەم بونەوەرەدا هەمیشە ڕاستوناڕاست هەبێ وە مل ملانێ بکەنو بەو مل ملانێیە بەهەشتو جەهەننەمی بەر دەکەوێت ، وە ئەگەر پەروەردگارت ئارەزۆی لێ بوایە نەیان دەتوانی شتی ئاوەها بکەنو دژایەتی تۆ بکەن کەوابو وازیان لێ بێنەو خەفەت مەخۆ کە باوەڕ ناهێنن ودوژمنایەتیت دەکەن زۆرنابات بەسزای کرداری خۆیان دەگەن دەی با هەر درۆ

هەڵببەستن تۆ پشت ببەستە بە خوا ئەو بەسە بۆتو یارمەتی دەرتە بە سەر دوژمنانتا.

﴿١١٣﴾ جا تا دڵی ئەوانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوای نیە ڕاکێشن بۆ لای ئەو قسە هەڵەو نادروستو دوژمنکاریانەو تا بەو شتە ڕازی ببنو تا هەڵی بەستن قسەی پڕو پوچو نادروست ئەوەی کە هەڵی دەبەستن ، واتە: هەرچی دەکەن با بیکەنوبلێ:

﴿١١٤﴾ ئایا بێجگە لە خوا بکەم بە ناوبژی کەر بۆ جیا کردنەوەی ڕاستو ناڕاست، لە حاڵێکدا ئەو ، ئەو زاتەیە کە ئەم قورئانەی ڕەوانە کردوە بۆ ئێوە بە شێوەیەکی ڕونکراوەو باسی هەمو شتێکی پێویستی ئێوەی کردوە ، وە ئەوانەی کە کتێبمان پێ داون وەك جولەکەو گاور دەزانن کە بە ڕاستی ئەمە لە لای پەروەردگاری خۆتەوە بە ڕاستیوبۆ مەبەستێکی ڕاستو دروست هاتوەو لەوانە عەبدوڵا ی کوڕی سەلام کە زانایەکی جولەکە بو لە پاشان موسڵمان بو زانایەکی زۆر یشی بو، کەوابو هەرگیز نەکەویتە گومانەوە لە ڕاستیو دروستی ئەم قورئانە. ئاشکرایە کەمەبەست گەلەکەیەتی ئەگینا پێغەمبەر ﷺ هەرگیز گومانی نەبوە.

﴿١١٥﴾ جا تەواو بو فەرمانی پەروەردگاری تۆ کەڕاستەو ڕێکو پێکەو هیچ کەمو کوڕیەکی تێدا نیە کە گۆڕینەریش نیە بۆ فەرمانەکانو بڕیارو یاساکانی ئەو زاتەو ئەو بیسەرە بۆ هەمو قسەکانو زانەرە بۆ هەمو ئیشەکانو هیچ شتێك لەو حەشار نادرێت.

﴿١١٦﴾ ئەوسا ئەگەر تۆ پەیڕەوی زۆرینەی خەڵکی سەر زەوی بکەیت ئەوە گومڕات دەکەنو لات دەدەن لە سەر ڕێگای خوا. ئەمەش مانای ئەوەیە کە زۆربەی خەڵك باوەڕ ناهێننو بەرەو سەر لێشێوانو گومڕاهیش خەڵکی بانگ دەکەنو بەم شێوەیە ئەم دوو قسەیە هەڵدەوەشێتەوە.

یەکەم : قسەی ئەو کەسانەی کە دەڵێن وەختێ پێویستە هەوڵی حاکمیەت بدرێت کە زۆربەی خەڵك باوەڕ بهێنێت کە ئەمەش بە گوێرەی ئەم ئایەتەو دەیان ئایەتی تر هەرگیز نابێ.

دووهەم : نابێ ئایینو حاکمیەتی خوا لە ڕێگای هەڵبژاردنەوە بێ، چونکە زۆربەی خەڵك نەك هەر باوەڕ ناهێننو دژی ئایین دەبن بەڵکو زۆربەی خەڵکی بانگەوازی گومڕاهی دەکەن وەك لێرەدا ئەفەرموی:"ئەگەر بە گوێی زۆربەی خەڵکی بکەی گومڕات دەکەن" بەم شێوەیە دەرئەکەوێت کە هەڵبژاردنوپەرلەمانانی ئەمڕۆ پەیوەندی بە ئیسلامو موسڵمانانەوە نیەو نابێ هاوبەشی بکەن لە هیچ کامیان دا هەروەك لە سورەتی یوسف/١٠٣ دا

دەفەرموێ: " زۆربەی خەڵکی ئەگەر چی سوریش بی لە سەریان هەر باوەڕ ناهێنن" . ئێمە لەم بارەوە شتێکمان نوسیوە بە ناو نیشانی (ئایین‌وهەڵبژاردن ) ئەگەر تەماشای بکەن بە سودە ، چونکە زۆربەی ئەو ئایەتانەی کە باسی زۆربەی خەڵك دەکەن نوسیومانە جێگای داخە لە گەل بونی ئەو هەمو ئایەتانەدا لە هەندێ وڵاتدا موسڵمانان دەیانەوێ لە رێگای سندوقی دەنگدانەوە بگەن بە سەروەریو ئەنجام دانی یاسای خوا، ئەو خوایەی کە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرموێ: ﴿ئەگەر پەیرەوی زۆربەی خەڵکی سەر زەوی بکەیت گومڕاهت دەکەن﴾ وە دەفەرموێ: ئەوان تەنها شوێنکەوتوی گومانن‌و بێجگە لەوەی کە درۆزن‌و ناحەق وێژن هیچ شتێکی تر نین‌و ئیشیان تەنها گومان بردن‌و خەملاندن‌و پێش بینیە تا جارێك راست دەربچێت سەدان جار هەڵە دەبێ.

(١١٧) بێگومان پەروەردگارت خۆی دەزانێ کە کێ گومڕاهەو لای داوە لە رێگاکەیو هەر ئەو دەزانێ کە کێیش رێگای خوای گرتوە.

(١١٨) بیخۆن گۆشتی ئەو حەیوانەی کە ناوی خوای لە سەر براوە لەکاتی سەر بڕینی دا ئەگەر ئێوە بە ئایەتەکانی خوا باوەڕدارن،واتە: ئەوەی کە ناوی خوای لە سەر نەبرێت مەیخۆن. ئینجا موسڵمان هەڵ دەنێ بۆ خواردنی ئەو گۆشتانەودەفەرموێ:

(١١٩) ئەوە چیە ئێوە ناخۆن گۆشتی ئەوەی کە ناوی خوای لە کاتی سەر بڕینیا لە سەر براوە کە بەدڵنیاییەوە خوا رۆشنی کردوەتەوە بۆتان ئەوەی کە حەرامی کردوە لە سەرتان مەگەر ئێوە ناچار بن بۆ خواردنی وەك گۆشتی بەرازو حەیوانی مردارۆبو، وە بە راستی زۆربەی خەڵك گومڕا دەبن بە هۆی ئارەزۆەکانیانەوە بەبێ ئەوەی هیچ زانینێکیان هەبێت تەنها پەیرەوی لە هەواو نەفسی خۆیانەوە دەکەن کە بێگومان پەروەردگارت خۆی دەزانێ کێ لەگای بگاردووەو کێ لە سنور دەرچووەو خراپەکارە.

(١٢٠) دەی واز بێنن لە هەمو گوناهی ئاشکراو پەنامەکی ، چونکە خوا ئاگادارە بە سەر هەمو کردارەکانتان دا بە راستی ئەو کەسانەی کە گوناح دەکەن بەم زوانە تۆڵەیان لێ وەردەگیرێت بە هۆی ئەو گوناحانەی کە کردویانە ، سەبارەت بە گوناح پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ: {**الْإِثْمُ مَا حَاكَ فِي صَدْرِكَ وَكَرِهْتَ أَنْ يَطَّلِعَ عَلَيْهِ النَّاسُ./** مسلم/. گوناحو تاوان ئەوەیە بێت بە دڵتاو پێت خۆش نەبێ کە خەڵك پێی بزانێ} ئینجا خوای داناو ئاگا دەفەرموێ:

(١٢١) ئەوسا نەکەن ئەو حەیوانانە بخۆن کە لە کاتی سەربڕینیاندا ناوی خوای لە سەر نەبربێت ، چونکە ئەو خواردنەو ئەو کردارە

وَمَا لَكُمْ أَلَّا تَأْكُلُوا مِمَّا ذُكِرَ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَقَدْ فَصَّلَ لَكُم مَّا حَرَّمَ عَلَيْكُمْ إِلَّا مَا اضْطُرِرْتُمْ إِلَيْهِ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا لَّيُضِلُّونَ بِأَهْوَائِهِم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِالْمُعْتَدِينَ ﴿١١٩﴾ وَذَرُوا ظَاهِرَ الْإِثْمِ وَبَاطِنَهُ ۚ إِنَّ الَّذِينَ يَكْسِبُونَ الْإِثْمَ سَيُجْزَوْنَ بِمَا كَانُوا يَقْتَرِفُونَ ﴿١٢٠﴾ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ۗ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰ أَوْلِيَائِهِمْ لِيُجَادِلُوكُمْ ۖ وَإِنْ أَطَعْتُمُوهُمْ إِنَّكُمْ لَمُشْرِكُونَ ﴿١٢١﴾ أَوَمَن كَانَ مَيْتًا فَأَحْيَيْنَاهُ وَجَعَلْنَا لَهُ نُورًا يَمْشِي بِهِ فِي النَّاسِ كَمَن مَّثَلُهُ فِي الظُّلُمَاتِ لَيْسَ بِخَارِجٍ مِّنْهَا ۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلْكَافِرِينَ مَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١٢٢﴾ وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ أَكَابِرَ مُجْرِمِيهَا لِيَمْكُرُوا فِيهَا ۖ وَمَا يَمْكُرُونَ إِلَّا بِأَنفُسِهِمْ وَمَا يَشْعُرُونَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا جَاءَتْهُمْ آيَةٌ قَالُوا لَن نُّؤْمِنَ حَتَّىٰ نُؤْتَىٰ مِثْلَ مَا أُوتِيَ رُسُلُ اللَّهِ ۘ اللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ ۗ سَيُصِيبُ الَّذِينَ أَجْرَمُوا صَغَارٌ عِندَ اللَّهِ وَعَذَابٌ شَدِيدٌ بِمَا كَانُوا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٤﴾

گوناحەو دەرچون لە سنورەو بەراستی شەیتانەکان وەحی دەکەنە لای دۆستەکانی خۆیان کە دەمە دەمەو موناقەشەتان لە گەل دا بکەن ، جا ئەگەر لە هەندێ مرۆڤی بێ باوەڕو خراپەکارەوە قسەی رێك‌و پێك‌و گرنگت گوێ لێ بو سەرت سوڕ نەمێنێو نەڵێیت چۆن شتی وا دەزانێ چونکە شەیتانە جنۆکەکان ئەو قسانەیان دەخەنە ناو دڵیانەوە بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی ساویلکە بۆنمونە: دەیان وت: بۆ حەیوانێك کە خۆتان بیکوژنەوە حەڵاڵەو دەیخۆن بەڵام ئەوەی کە خوا بیکوژێتەوە نایخۆن؟ جا ﷻ دەفەرموێ: خۆ ئەگەر ئێوە بە گوێی ئەوان بکەن‌و ئەو حەیوانە مردارۆ بووە بخۆن بە راستی ئێوەش لە ریزی موشریکان دەبن. لێرەدا پێویستە ئەم چەند شتە بڵێین:

**یەکەم**: هەر حەیوانێ بە هۆی سەگی مۆچێنراوو باڵندەی موچێنراوە گیراو پێش ئەوەی خاوەنەکەی بیگاتێوسەری ببڕێ بمرێت، حەڵاڵە خواردنی.

**دووهەم**: هەر حەیوانێك کە گۆشتی بخورێتو ئەهلی کتێب سەری بڕی بێت حەڵاڵە خواردنی.

**سێهەم**: هەر حەیوانێك سەر بڕاو هەڵقەیەك لە قوڕگی بە سەریەوە نەڕۆیشت یا موسڵمانیش سەری بڕی بێتو(بسم الله) یشی کرد بێ، حەرامە خواردنی.

**چوارەم**: هەر حەیوانێك بە رێك وپێکی سەر بڕاو ناوی بێجگە لە خوای لە سەر وترا نابێ گۆشتی ئەو حەیوانە بخورێت.

**پێنجەم**: هەر حەیوانێك كە پاشگەز بوویەك (مورتد) یان بێ باوەڕێكی بێ كتێب سەری ببڕێ یا چاكیشی سەر ببڕێت گۆشتی ئەو حەیوانە ناخورێت.

**شەشەم** : ئەگەر موسڵمانێك حەیوانێكی بە ڕێكوپێكی سەر بڕی بەڵام (بسم الله)ی نەكرد ئەخورێت یان نە؟ زانایان سێ قسەیان هەیە

**هەندێكیان** دەڵێن: ئەو سەر بڕاوە ناخورێت ئیتر ئەو (بسم الله) یەی لە بیر چوبێت یان دەستی ئەنقەست نەی وتبێت لەوانە عەبدوڵای كوڕی عومەرونافیع وشەعبیومحمدی كوڕی سیرینو ریوایەتێكی ئیمام مالیكو ئیمامی ئەحمەدیشە.

**دووهەمیان** : دەڵێن: بە پێچەوانەی یەكەمەوە دەڵێ (بسم الله) كردن سونەتە، جا ئەگەر نەكرا بە سەهو یان بە دەستی ئەنقەست زیانی نیەو ئەو گۆشتە حەڵاڵە، ئەمەش مەزهەبی ئیمامی شافعیوهەمو یارەكانیەتیو ریوایەتێكی ئیمام مالیكو ئیمام ئەحمەدیشەولە عەبدوڵای كوڕی عەباسوئەبو هورەیرەو عەتای كوڕی ئەبو رەباحەوە باسكراوە.

**سێهەمیان**: دەڵێ ئەگەر كابرا (بسم اللهِ ) كردنی لە بیر چو ئەوە ئەو گۆشتە حەڵاڵە بەڵام ئەگەر هەر بە دەستی ئەنقەست نەیگوتبو حەرامەو نابێ بخورێت. ئەمەش بە ناوبانگە لە مەزهەبی ئیمامی مالیكو ئەحمەدی كوڕی حەمبەل داو مەزهەبی ئەبو حەنیفەیشە.

(١٢٢) ئایا ئەو كەسەی كە مردوە ئەوسا ئێمە زیندوی بكەینەوە، گومڕایە ڕێنمایی بكەینو روناكیەكی وای پێ بدەین كە بەو روناكیە بە ناو خەڵكا هاتو چۆ بكات ئایا ئەم كەسە وەك ئەو كەسیە كە لە ناو چەندین تاریكایی دا بێ نەتوانێ دەربچێ لێی؟ نەخێر ئەم دوانە هەرگیز وەك یەك نین، جا مادام وەك یەك نین دەی بۆ بێ باوەڕان بیر لە خۆیانو پاشەرۆژیان ناكەنەوە؟ وەڵامەكەی ئەمەیە كە خوا دەفەرموێ: چونكە جوان كراوە بۆ بێ باوەڕان ئەو كردارە ناپەسندانەو ئیشی خۆیانیان بەلاوە لە ئیشی هەمو خاوەن باوەڕێك بە چاكترو جوانتر دەزانن. ئینجا اللهُ دڵی پێغەمبەرمان ﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ:

(١٢٣) هەروەك چۆن ئەی محمدﷺ تۆ لە مەكەدا دوژمنانێكت هەیەو بەرەنگاریت دەكەن بزانە كە ئەمە شتێكی تازە نیەوتەنیا بۆ تۆ بوبێت هەر ئاوەها ئێمە لە هەمو شارو گوندێكدا گەورەكانی ئەو شارەمان سەروەتو سامانو هێزمان پێ داون تا ئەوان دەستیان كردوە بە فرو فێڵ لەو شارەدا دژی پێغەمبەرانوپیاوچاكانی سەردەمی خۆیان ، بەڵام لەو فرو فێڵو ئیشە خراپانەیان بێجگە لە سەر شۆڕیوشكان هیچیان بۆ نەماویەوە وەك دەفەرموێ: خۆ فێڵیان لە كەس نەكردوە بێجگە لە خۆیان بەڵام خۆیان هەستی پێ ناكەن. ئەمە وەك ئایەتی شانزەی سورەتی (ئیسرا) وایە كە دەفەرموێ: ﴿جا هەر كاتێ بمانەوێ جێگایەك لە ناو ببەین فەرمان دەدەین بە سەر خاوەن دەسەڵاتو گەورەی ئەو جێگایە دا كە پەیڕەویمان بكەن ، بەڵام ئەوان دەست دەكەن بە تاوانوخراپە لەو جێگایەداو موستەحەقی تۆڵە دەبنو بڕیاری تۆڵە سەندنەوەی ئێمە لە ستەمكاران دێتە جێ ، ئینجا ئەو جێگایە لە ناو دەبەینو وێرانی دەكەین﴾ بەڵێ تاوانباران كاتێ كە تاوانو خراپە دەكەن ئەگەر پێیان بوترێت: دەست لە تاوان بكێشنەوەو خراپە مەكەن هەر زۆر بەزویی دەڵێن: ئازادیە، دیموكراتیە وا دەزانێ ئازادیو دیموكراتی تەنها بۆ ئەوەو كەسی تر مافی ئازادی نیەو نابێ قسە بكات! ئاخ مرۆڤ وەختێك لات دا لە یاسای خوا چەند لاسارو نەفامیتو چەند هەڵەو نەزانیت !! ئەگەر ئازادی هەبێ هی هەمو كەسێكە خۆ تەنها مولكی پێڕو تاقمێك نییە. ئینجا خوا درێژە بەباسی لاساری بێ باوەڕان دەداتودەفەرموێ:

(١٢٤) جا هەر كاتێ نیشانەیەك بێتە لایان دەیان وت: ئێمە باوەڕ ناهێنین هەتا وەك ئەوەی كە دراوە بە پێغەمبەران نەدرێ بە ئێمەیش، وە هەر كام لەوان دەیانەوێ پەیامێكیان پێ بدرێتوراستە خۆ پەیوەندیان بە خواوە هەبێت ئینجا خوا دەمكوتیان دەكاتودەفەرموێ: خوا زانایەو دەزانێ لە كوێ دا پەیامی خۆی دادەنێتو دەزانێ كە كێ شایستەیەو بە راستی هەڵی دەگرێت ، پەیامی خۆی بە هەمو كەس نادات بەم زوانە ئەوانەی كە لە دنیادا ستەموتاوان دەكەن دووچاری شەرمەندەیی وسەر شۆڕی دەبن لە لای خوا لە رۆژی دوایدا، هەروەها دوچاری سزایەكی دەردناك دەبن، چونكە لە دنیادا فرو فێڵیان دەكرد دژی پێغەمبەروخاوەن باوەڕان جا وا لەو رۆژەدا سەر شۆڕ دەبنوسزا دەدرێن وەك لە سورەتی (غافر/٦٠) دا دەفەرموێ: ﴿بەبێگومان ئەوانەی كە خۆیان بە گەورە دەگرن لە بەرامبەر بەندایەتی كردنی ئێمەوە بەم زوانە سەر شۆڕانە دەخرێنە ناو جەهەنەمەوە﴾ ئینجا دەفەرموێ:

(١٢٥) ئەو كەسەی كە اللهُ ئیرادەی خێری پێ بكاتو هیدایەتی بدات دڵی فرەوان دەكات بۆ وەرگرتنی ئیسلام ، چونكە خۆی ئەهلی خێرەو بە دوای خێردا دەگەڕێت خواش دڵی دەداتەوەو ئیشەكانی بۆ ئاسان دەكاتو بە چاكی یەكخواپەرستیو باوەڕی راستەقینەی بۆ جێگیر دەكات. پرسیار كرا لە پێغەمبەرﷺ كە كام باوەردار زیرەكترە؟ فەرموی: {أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْرًا وَأَحْسَنُهُمْ لِمَا بَعْدَهُ اسْتِعْدَادًا أُولَئِكَ الْأَكْيَاسُ/ابن ماجه. حسنه الألبا / ئەوەیان كە زۆر

یادی مردن بکاتەوە ، وە ئەوەیان کە جوانتر خۆی ئامادە بکات بۆ پاش مەرگ ئائەوانەن زیرەکەکان}.

ئینجا ﷲ پاش باسی خەڵاتی نیەت باشان، باسی بەدبەختی نیەت خراپانمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: ئەوسا هەر کەسێك خوا ئیرادەی گومڕا بونی بکات واتە کابرا خۆی ببێتە هۆی ئەوەی کە گومڕا بێتو گوێ لە ئایین نەگرێتو لاساری بکات ئەو کاتە خوا دڵی زۆر تەنگ دەکات بە شێوەیەك کە هەمیشە لە گومان دا بیتو جێگای هیچ قسەیەکی چاکی تێدا نەبێتەوە، دەڵێن جارێکیان عومەر (خوای لێی رازی بێ) پرسیاری کرد لە کابرایەکی دەشتەکی کە بە چی دەڵێن: (حرج)؟ وتی: بە درەختێك دەڵێن کە نە شوان دەتوانی لێی نزیك ببێتەوەو نە حەیوانی کێویش دەتوانێ بیخوات. ئینجا عومەر فەرموی : دڵی مونافق ئاوایە هیچ خەیرێکی پێ ناگات ئەو دڵ تەنگیە وەك چی وایە؟ دەفەرموێ: وەك ئەو کەسە وایە کە سەر دەکەوێ بۆ ئاسمان ، واتە: وەك کەسێك کە سەر کەوێت بۆ شوێنێکی بەرز چۆن دڵی تەنگ دەبێ‌وهەناسەی سوار دەبێ‌و بێجگە لە بیری هاتوچۆی هەناسە شتێکی تری بە خەیاڵدا نایەت هەر بەو شێوەیە ئەو کابرای سەر لێ شێواوەش بێجگە لە ژیان بیر لە شتێکی تر ناکاتەوە ئەمەش یەکێکە لە موعجیزەکانی قورئان کە لەو کاتەدا نەزانراوە کە سەرکەوتن بۆ ئاسمان پێویستی بە هەوا بردن هەیە ، چونکە لە سنوری زەوی سەرکەوتنی هەوا نامێنێ‌و کابرا دەخنکێ ئەگەر هەوای پێ نەبێ زانیاری تازەیی لەم دوو سەدەی دواییدا بەم راستیەی زانیوە کە قورئان هەزاروچوارسەد ساڵ لەمەو پێش ئاماژەی بۆ کردووەلە وێنەی ئامۆژگاریش هیچی کەم نەبوەتەوە دەگونجێ (فی) بە مانای (علی) بێت واتە هەر چۆن سەرکەوتن بۆ سەر ئاسمان بەبێ هۆ لە توانای مرۆڤ دا نیە ، هەرئاوەها ئەو کەسانەیش کە گومڕا بونو دڵیان تەنگ کراوە ناتوانن باوەڕ بێنن مەگەر هۆی پەیدا بکەن کە پەشیمان بوونەوە لەتاوانو گەڕانەوەیە بۆلای ﷲ ئینجا دەفەرموێ: هەر ئاوەها ﷲ سزای خۆی دادەنێت لە سەر ئەو کەسانەی کە ئیمان ناهێنن. دووبارە دەردەکەوێت کە ﷲ ستەم لە کەس ناکات بەڵکو کابرا خۆی نایەوێت باوەڕ بێنێت بۆیە ئاوای بە سەر دێت. ئینجا دەفەرموێ :

(١٢٦) ئەی محمد ﷺ ئەمە رێگای خوای تۆیە رێکەو هیچ چەوتیەکی تێدا نیە بە حەقیقەت ئێمە نیشانەکانی خۆمانمان روون کردەوە بۆ ئەو گەلەی کە بیر بکەنەوەوپەند وەربگرن تا کەس بەهانەی نەبێت. جا ئەو کەسەی کە بەراستی ئەم رێبازە بگرێتولە پەندو ئامۆژگاریەکان سود وەربگرێتوبە دڵوبە گیان خۆی تەسلیمی ئەم رێبازە راستە بکات.

فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجٗا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٢٥﴾ وَهَٰذَا صِرَٰطُ رَبِّكَ مُسۡتَقِيمٗاۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ ۞ لَهُمۡ دَارُ ٱلسَّلَٰمِ عِندَ رَبِّهِمۡۖ وَهُوَ وَلِيُّهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢٧﴾ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ قَدِ ٱسۡتَكۡثَرۡتُم مِّنَ ٱلۡإِنسِۖ وَقَالَ أَوۡلِيَآؤُهُم مِّنَ ٱلۡإِنسِ رَبَّنَا ٱسۡتَمۡتَعَ بَعۡضُنَا بِبَعۡضٖ وَبَلَغۡنَآ أَجَلَنَا ٱلَّذِيٓ أَجَّلۡتَ لَنَاۚ قَالَ ٱلنَّارُ مَثۡوَىٰكُمۡ خَٰلِدِينَ فِيهَآ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۗ إِنَّ رَبَّكَ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿١٢٨﴾ وَكَذَٰلِكَ نُوَلِّي بَعۡضَ ٱلظَّٰلِمِينَ بَعۡضَۢا بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٢٩﴾ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ شَهِدۡنَا عَلَىٰٓ أَنفُسِنَاۖ وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ ﴿١٣٠﴾ ذَٰلِكَ أَن لَّمۡ يَكُن رَّبُّكَ مُهۡلِكَ ٱلۡقُرَىٰ بِظُلۡمٖ وَأَهۡلُهَا غَٰفِلُونَ ﴿١٣١﴾

(١٢٧) بۆ ئەوان هەیە خانوی ئەمنو ئاسایش لەلای پەروەردگاری خۆیانو هەر خۆی دۆستیانە بە هۆی ئەو کردارە چاکانەی کە ئەوان دەیکەن. ئەمانە چونکە لە دنیادا خویان لە سەر ئایین ئەزیەت دەدەنو خۆیان نارەحەت دەکەن خوای میهرەبان خانویەکیان پێ دەدات کە جێگای حەسانەوەو ئەمنوئاسایش بێت. بە راستی هەر خۆیەتی دەتوانێ ئەو پاداشتە بەرێزو گرنگە بە بەندەکانی بدات. ئینجا دەفەرموێ:

(١٢٨) ئەی محمدﷺ باس بکە ئەو رۆژەی کە ئێمە هەمویان کۆ دەکەینەوەو دەڵێین: ئەی کۆمەڵی جنۆکە ئێوە ژمارەی خۆتانتان زۆر کرد بە هۆی لادانی خەڵکێکی زۆرەوە لە رێگای راستو کردنتان بە بێ باوەڕو بە هاوەڵی خۆتان ، جا دۆستەکانیان لە مرۆڤ دەڵێن: ئەی خوای ئێمە هەندێکمان سودمان وەرگرت لە هەندێکمان. سودو لەزەتی مرۆڤ لە جنۆکە دەبێ چی بێ جنۆکە فەرمانده بوەو مرۆڤیش فەرمانبەردارو شەیتان چی وتوە مرۆڤەکەش وای کردوە ئایا ئەمە لەزەت وەرگرتنە؟! دیارە ئەوان لە دنیادا ئەو بە گوێ کردنەی شەیتان بە لەزەت دەزانن و جنۆکەیش بە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ بە گوێی کردون خۆیان زۆر بە زل زانیوەو کەیفیان پێ کردوە لە دنیادا جا بە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ دوای ئەوان کەوتوە زیاتر ئەوانیان گومڕاتر کردوە ، دەڵێن: ئێمە بوین بە گەورەی مرۆڤو جنۆکە ، ئینجا دەڵێن: ئەی خوایە گەیشتین بەو ماوەیەی کە بۆت دانا بوین واتە گەیشتین بە

وَلِكُلٍّ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا يَعۡمَلُونَ ﴿١٣٢﴾ وَرَبُّكَ ٱلۡغَنِيُّ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفۡ مِنۢ بَعۡدِكُم مَّا يَشَآءُ كَمَآ أَنشَأَكُم مِّن ذُرِّيَّةِ قَوۡمٍ ءَاخَرِينَ ﴿١٣٣﴾ إِنَّ مَا تُوعَدُونَ لَأٓتٖۖ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ يَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَامِلٞۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١٣٥﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡۗ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ زَيَّنَ لِكَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ قَتۡلَ أَوۡلَٰدِهِمۡ شُرَكَآؤُهُمۡ لِيُرۡدُوهُمۡ وَلِيَلۡبِسُواْ عَلَيۡهِمۡ دِينَهُمۡۖ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ﴿١٣٧﴾

مردنو مردینو هاتینەوە لات بۆ حیساب. ئینجا خوای گەورەش دەفەرموێ: ئەو قسانەتان بێ سودەو ئاگر جێگەتانە بۆ هەمیشەو لە ناوی دا دەمێننەوە مەگەر کاتێك کە خوا ئارەزۆی لێ بێت. ئینجا ﷲ دەفەرموێ: بێگومان پەروەردگارت ئەی محمد ﷺ دانایە لە ئیشەکانی داو زانایە بە هەمو ئیشەکانتان.

(١٢٩) ئەوسا هەر ئابەو شێوەیە هەندێك لە ستەمکاران زاڵ دەکەینو دەیکەین بە سەر پەرشتی هەندێکی تریان بە هۆی ئەو تاوانانەی کە کردویانەولە رۆژی دوایشدا هەر تاوانبارێك لە گەل تاوانبارێکی وەك خۆی دا لە یەك جێگادا سزا دەدرێن،واتە: ئەم ئایەتە دەگونجێ مەبەست دنیا بێت وەك لە پێشەوە مانامان کرد یان مەبەست قیامەت بێ وەك مانای دووهەم، جا ئەو کاتە فریشتەکان پێیان دەڵێن :

(١٣٠) ئەی کۆمەڵی جنۆکەو مرۆڤە ئایا نەهاتە لاتان پێغەمبەرانێك لە خۆتان کە دەیان خوێندەوە بۆتان نیشانەکانی ئێمەو دەیان ترساندن لە گەیشتن بە رۆژێکی ئاوەها کە بگرەوبەردەتان لە گەلدا دەکرێت؟ دەڵێن: ئێمە شایەتین لە سەر خۆمان کە پێغەمبەرمان بۆ هاتوەو لەم رۆژەی ترساندوین ، بەڵام ئەم شایەتیە هیچ سودێکیان پێ نادات چونکە ئەوان لە دنیادا بە گوێی پێغەمبەرانیان نەکردووەو ژیانی دنیا ئەوانی سەرگەرم کردوەو بیریان لە پاشەرۆژی خۆیان نەکردوتەوە ، وە شایەتی دەدەن لە سەر نەفسی خۆیان کە بەبێشك ئەوان بێ باوەڕ بوون بەم رۆژەو بە رەوانە کراوانی خوا . بۆیە ئەوان ئاگر جێگایانەو ستەمیان لێ نەکراوە وەك دەفەرموێ:

(١٣١) ئا ئاوا ئێمە نێرراوی خۆمان رەوانە کردوەو ئەوان باوەڕیان پێ نەهێناوە بۆیە لە ناومان بردوون ئەگینا پەروەردگارت هەرگیز بە بێ تاوان خەڵکی جێگایەك لە ناو نابات کە ئەو خەڵکە ئاگایان لە هیچ نەبێتو بەرنامەو ئایینی خودا یان پێ نەگەیشتبێت هەرچەند خوا نەناسیش بن واتە پاش ترساندنو ئاگاداری ئەگەر سەرپێچی کرا ، ئینجا خوا تۆڵەیان لێ وەردەگرێت.

(١٣٢) ئەوسا بۆ هەمو مرۆڤێك لە چاكوخراپ ، چاکەکاران لە ناو خۆیانداو خراپەکارانیش لە ناو خۆیاندا چەندین پلەی جیا جیایان هەیە هەر کەس بە گوێرەی ئەوەی کە کردویەتی. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: { هەیە لە ناو بەهەشتدا لە خوارەوە دەنوارێت بۆ پلەی سەروتر وەك چۆن مرۆڤەکان لە دنیادا لە سەر زەوییەوە دەنوارنە ئەستێرەکانی ئاسمان} ئەوەندە جیاوازی هەیە لە پلەکانی بەهەشتدا، ئەوسا پەروەردگارت بێ ئاگا نیە لەوەی کە ئەوان دەیکەن هەرکەس بە گوێرەی کردەوەی خۆی سزا وەردەگرێت.

(١٣٣) خۆ پەروەردگارت دەوڵەمەندەو بێ نیازە لە بەندایەتی بەندەکانیو خاوەن رەحمەتە بۆ یان ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بێ ئێوە لادەباتو کەسانێکی تر کە ئارەزۆی لێ بێ دێنێتوادی دەنێت لە جێگای ئێوەدا وەك چۆن ئێوەی دروستکردوە لە نەوەی گەلانی تری پێش خۆتان ، واتە: ئەم لابردنو هێنانە شتێکی زۆر زۆر ئاسانە لای خوا ئێوە خۆتان هەر بەم شێوەیە بەم رۆژە گەیشتون ئەگەر پێش تۆ هەروا بمایەوە تۆ نەدەهاتیە جێگای ئەوان ، جا چاك بزانن کە،

(١٣٤) بەدڵنیاییەوەئەوەی کە بەڵێنتان پێدراوە لە بەهەشتو لە جەهەنەم ، لە سزاو لە خۆشی، هەموی دێتەدیو ئێوە ناتوانن رێگای هاتنی بگرن ، بەڵکو خوا خاوەنی هێزو توانایە لە سەر لەناوبردنو زیندو کردنەوەتان پاش ئەوەی کەدەرزێنو دەبن بە خاك ، جا ئەوەتا دەبینی کە خوا بێ باکەو هەڕەشە دەکاتو دەفەرموێ:

(١٣٥) ئەی محمد ﷺ بە گەلەکەت بڵێ: ئەی گەلی من هەرچی لە تواناتاندایە بیکەنوچۆنتان پێ خۆشە بۆ خۆتان وا بکەن منیش چۆنم پێ خۆشە وا دەکەم لە مەولا دەزانن سەر ئەنجامی ئەو ماڵە بەرزو بەرێزە کە بەهەشتی هەتا هەتاییە بۆ کێیە؟ بێگومان بڕیار وایە کە هیچ کاتێك ستەمکاران سەرکەوتو خۆشبەخت

نەبن ، جا ئیتر چ دەکەن‌وچی بە باش دەزانن بۆ خۆتان بێ منەت بن چونکە جێگاتان ئاگری جەهەنەمە وەك لە سورەتی (المرسلات/٤٦ ) دا دەفەرموێ:﴿ بخۆن‌و رابوێرن کەمێك بە راستی ئێوە تاوانبارن﴾ ئینجا خوای دانا سیفەتێکی تری بت پەرستانمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ :

(١٣٦) خۆ ئەو بت پەرستانە لەوەی کە زەوی سەوزی دەکرد ولە بەچکەی مەڕو بزن‌و وشتر ومانگا بەشێکیان دادەنا بۆ خواو دەیان وت: ئەمە بۆ خوایە وە ئەمەش بۆ بتەکانمانە ، جا ئەوەی کە بۆ بتەکانیان بو بە تەواوی بۆیان خەرج دەکردو نەیان دەهێشت هیچی کەم ببێتەوەوبەلای خوا دا بچێت‌و ئەوەش کە بۆ خوایان دانابو هەرچی کەم بکردایەوەوبچوایە سەر بەشی بتەکان نەیان دەهێنایەوە !! بەراستی بڕیارێکی ناشیرین‌وپیس دەدەن. چونکە شینایی‌و مەڕو ماڵاتەکانیان موڵکی خوایە کە چی ئەوان لە دژایەتی خوادا بە کاری دەهێنن لەوەش خراپتر بەشەکەی خوا بە شێوەیەکی ناتەواوو کەم‌و کوڕ جێ بە جێ دەکەن بەڵام بەشی بتەکان بە زیادەوە بۆیان جێ بە جێ دەکەن لەگەل ئەوەشدا دەڵێن: خوا بێ نیازە بۆیە وا دەکەین بەڵام بتەکان موحتاجن؟ جا ئەمە کەی ژیریە کە تۆ واز لە خوایەکی خاوەن دەسەڵات وداناو زاناو بێ نیاز بێنی‌و پەیڕەوی شتێ بکەیت کە موحتاج بێ؟ من لێرەدا مانایەکی تری لێ وەردەگرم هەرچەند ئەوەی پێشوو بەلاوە جوانەو رای زۆربەی تەفسیر نویسانە. بت پەرستان لەوەی کە زەوی سەوزی دەکردولە بەچکەی ئەو چوار حەیوانە بەشێکیان دادەنا بۆ خواو بەشێکی تریان دادەنا بۆ بتەکان خوایش دەفەرموێ: ئەوەی کە دای دەنێن بۆ بتەکان ئەوە شتێکی نادروستە لای خواو وەری ناگرێت ، وە ئەو بەشەش کە دای دەنێن بۆ خوا ، چونکە هاوبەشی بۆ دادەنێن ئەویش ناگات بە خوا چونکە خوا وەری ناگرێت وەك لە حەدیسی صحیح دا هاتوە کە دەفەرموێ: { قَالَ ا تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَا أَغْنَى الشُّرَكَاءِ عَنْ الشِّرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ / مسلم/ خوای خاوەن خێرو بەشکۆ فەرمویەتی: من بێ نیازترینی هاوبەشەکانم لەهاوبەشی دا، هەر کەسێك ئیشێك بکات‌و بێجگە لە خۆم کەسێکی تر لە گەڵدا بکات بە هاوبەش ئەوە وازی لێ دەهێنم لە خۆی‌ولە هاوبەشەکەشی‌و لێی وەرناگرم} واللہ اعلم. واتە دەبێ هەمو ئیشێکی چاك لەبەر خوابێ ئەگینا شیرکەوزیانی هەیە نەسوود، دیسان خوای دانا خراپی‌و ناشیرینی سیفەتێکی تری بت پەرستانمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٧) جا هەر ئاوەها هاوبەشەکانیان کە شەیتانە جوانی کرد بۆ زۆربەی بت پەرستان کوشتنی منداڵەکانیان پێیان دەوتن:

وَقَالُوا۟ هَٰذِهِۦٓ أَنْعَٰمٌ وَحَرْثٌ حِجْرٌ لَّا يَطْعَمُهَآ إِلَّا مَن نَّشَآءُ بِزَعْمِهِمْ وَأَنْعَٰمٌ حُرِّمَتْ ظُهُورُهَا وَأَنْعَٰمٌ لَّا يَذْكُرُونَ ٱسْمَ ٱللَّهِ عَلَيْهَا ٱفْتِرَآءً عَلَيْهِ ۚ سَيَجْزِيهِم بِمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ (١٣٨) وَقَالُوا۟ مَا فِى بُطُونِ هَٰذِهِ ٱلْأَنْعَٰمِ خَالِصَةٌ لِّذُكُورِنَا وَمُحَرَّمٌ عَلَىٰٓ أَزْوَٰجِنَا ۖ وَإِن يَكُن مَّيْتَةً فَهُمْ فِيهِ شُرَكَآءُ ۚ سَيَجْزِيهِمْ وَصْفَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ (١٣٩) قَدْ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓا۟ أَوْلَٰدَهُمْ سَفَهًۢا بِغَيْرِ عِلْمٍ وَحَرَّمُوا۟ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفْتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ ۚ قَدْ ضَلُّوا۟ وَمَا كَانُوا۟ مُهْتَدِينَ (١٤٠) ۞ وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَ جَنَّٰتٍ مَّعْرُوشَٰتٍ وَغَيْرَ مَعْرُوشَٰتٍ وَٱلنَّخْلَ وَٱلزَّرْعَ مُخْتَلِفًا أُكُلُهُۥ وَٱلزَّيْتُونَ وَٱلرُّمَّانَ مُتَشَٰبِهًا وَغَيْرَ مُتَشَٰبِهٍ ۚ كُلُوا۟ مِن ثَمَرِهِۦٓ إِذَآ أَثْمَرَ وَءَاتُوا۟ حَقَّهُۥ يَوْمَ حَصَادِهِۦ ۖ وَلَا تُسْرِفُوٓا۟ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ (١٤١) وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ (١٤٢)

منداڵەکانتان بکوژن چونکە توشی کەم دەستی دەبن‌و کچەکانتان بکوژن ، چونکە دوچاری عەیب‌وعار دەبن ، بۆیە ئاوایان لێدەکردن بۆ ئەوەی لە ناویان ببەن ، وەبۆ ئەوەی کەئایینەکەیان لێ بگۆڕن ، وە ئەگەر خوا ئارەزوّی لێ بوایە ئەوان ئەوەیان نەدەکرد کەواتە ئەی محمدﷺ تۆ خەفەت مەخۆ بۆ ئەمانە کە ئاوا رەفتار گەلێك دەکەن ، چونکە ئێمە ئەم ژیانەمان بۆ تاقی کردنەوە دروستکردوە جا وازیان لێ بهێنە بە خۆیان‌وبە درۆکانیانەوە. ئینجا ﷲ سیفەتێکی خراپی تری بت پەرستانمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٨) خۆ بت پەرستان بە گومانی خۆیان دەیان وت: ئەم مەڕو ماڵاتەو ئەم کێڵگەیە قەدەغەییەو نابێ لێیان بخوات مەگەر ئەو کەسەی کە خۆمان ئارەزوّمان لێ بێ، بەڵێ ئەم بت پەرستانە هەر وا لە خۆیانەوە ئەم سێ بڕیارەیان دەدا :

یەکەم - وەك وترا هەندێ لە حەیوانات‌ودانەوێڵەیان لە خەڵك قەدەغە دەکرد کە بە کەیفی خۆیان بو ، بۆ کێی حەلاڵی بکەن و لە کێی قەدەغە بکەن!!

دووهەم - سواری هەندێك لە حەیوانەکانیان قەدەغە دەکرد، نەدەبو کەس سواریان ببێ‌و باریان لی باربکرێت، دیسان ئەمەش هەر بە مەیلی خۆیان‌و هیچ بەڵگەیەکیان بە دەستەوە نەبو.

سێهەم - لە کاتی سەربڕینی هەندێ لە حەیوانات دا ناوی خوایان نەدەهێنا ئەمەش هەر بڕیارو ئارەزوّی خۆیان بو کەچی دەیان

وت: خوا وای بڕیار داوەودرۆیان بە دەم خوداوە دەكرد لە مەو دوا ﷲ تۆڵەیان لێ دەستێنێت بە هۆی ئەو درۆیانەی كە بە دەم خواوە دەیان كرد.

(١٣٩) جا دەیان وت: ئەمەی كە لە سكی ئەم مەڕو ماڵاتانەدایە تایبەتە بۆ نێرینەكانو قەدەغەیە لە مێینەكان ، واتە: ئەگەر نێرینەی ببوایە پیاوەكان سەریان ئەبڕیو ئەیان خواردو ئەگەر مێینە بوایە وازیان لێ دەهێنا ، وە ئەگەر مردوی ببوایە ئەوا هەردووك تێیدا شەریك دەبون واتە نێرو مێ دەیان خواردو دەیان وت: خوا ئەم بڕیارەی داوە. بەم زوانە خوا تۆڵەیان لێ دەسێنێ بە هۆی ئەو بڕیارە ناشیرینەوە كە بۆ خوای دادەنێن، بێگومان ئەوزاتە دانایە لە ئیشەكانی داو زانایە بەو ڕەفتارو بڕیارە ناپەسندەی كە دەیدەن. ئینجا دەفەرموێ:

(١٤٠) بە حەقیقەت زیانیان كردو تیا چون ئەو كەسانەی كە منداڵەكانی خۆیان كوشتن بە گێلیو بە نە زانیو ئەوەی كە خوا پێی دەدان لە بژێوی هەر لە خۆیانەوە درۆیان بە دەمی خواوە دەكردو قەدەغەیان كردو دەیان وت: خوا ئاوەها بڕیاری داوە بە ڕاستی ئەوان گومڕا بوونو لە ڕیزی ڕێنمایی كراواندا نەبون. ئەمانە لە هەردوو دنیادا زیانیان كرد ماڵو منداڵیان لە دەست داو دوا ڕۆژیش سزای سەختیان بۆ ئامادە كراوە . ﴿خسر الدنیا والاخرة﴾ بۆ ئاوەها كەسانێكە.

ئینجا خوای داناو میهرەبان باسی هەندێ لەنیعمەتەكانی خۆی دەكاتو دەفەرموێ:

(١٤١) جا خوا ئەو زاتەیە كە چەندین باخچەی كەپر بۆ كراوو كەپر بۆ نەكراوی دروستكردوە هەندێكیش دەڵێن ﴿مَّعۡرُوشَٰتٖ﴾ ئەو درەختانەیە كە خەڵك بۆ خۆی دەیاننێژێو﴿وَغَيۡرَ مَعۡرُوشَٰتٖ﴾ ئەوانە ی كە خۆیان دەڕوێن لە چیاو چۆڵ بە هەر حاڵ ئەم هەمو دارو درەختو شینایییە هەمویان بەشێكن لە نیعمەتە فرەوانو بەر بڵاوەكەی ﷲ ، جا پاش ئەوەی كە بە شێوەی گشتی باسی دارو درەختەكانو مێوەكانی كرد وا ئێستا بە تایبەتی ناوی ئەمانە دەباتو دەفەرموێ: خۆ خورماو دانەوێڵەی دروستكردوە كە خواردنی ئەمانە جیان لە یەكو هەر یەك لەمانە تامو شێوەی تایبەتی بەخۆی هەیە ، وە زەیتونو هەناریشی دروستكردوە هەیانە لە یەك دەچن لە شێوەو لە تامیان دا هەشیانە لە یەك ناچن نە لە شێوەو نە لە تامیان دا ، یان لە یەك ئەچن لە ڕەنگدا بەڵام لە یەك ناچن لە تام دا بخۆن لەو بەرو بومانە كاتێ كە بەرو بومیان گرتو حەقی خۆیشی لێ بدەن لە كاتێ كە دروێنە دەكرێتو بەرو بومەكەی هەڵدەگرن .

﴿حصاد﴾ كاتی دروێنە كردنە . جابیری كوڕی عەبدوڵادەڵێ: { أن النبي ﷺ أَمَرَ مِنْ كُلِّ جَادٍ عَشْرَةِ أَوْسُقٍ مِنْ التَّمْرِ بِقِنْوٍ يُعَلَّقُ فِي الْمَسْجِدِ لِلْمَسَاكِينِ ./ امام احمد. ئیبنو كەسیر دەڵێ: ئەم ڕیوایەتە (جيد قوي/ چاكوبەهێزە) /واتە: پێغەمبەرﷺ بڕیاری دا بە سەر ئەو كەسەی كە دە وسق خورمادەبڕێ هێشویەك بێنی بۆ مزگەوتو هەڵواسرێت بۆ بێ نەوایان} هەندێك دەڵێن: ئەمە زەكاتەوهەندێكی تر دەڵێن: ئەمە شتێكی زیاتر لە زەكاتە. ئینجا خوا دەفەرموێ: زیادە ڕەویی نەكەن بە ڕاستی خوا زیادە ڕەوانی خۆش ناوێت كەوابو لە بەندایەتیشدا زیادە ڕەوی جوان نیە چونكە كابرا ماڵی خۆی بە زیادەڕەوی خەرج بكاتو فەقیر بكەوێ دەبێ بە بار بە سەر كۆمەڵەوەو ئایینی پاكو بێ گەردی ئیسلام بەو ئیشە ڕازی نیە. هەندێكی تر دەڵێن: زیادەڕەویی بریتیە لەو حەقانەی كە ﷲ دایناوە مادام بە گوێرەی پێویست حەقەكەی لێ نەدات زیادەڕەوییەو خوا خۆشی ناوێت ، جا ئەگەر كابرا باغێكی هەبو حەق نیە لە خەڵكی ڕاگوزەر بەرگری بكات، وە ئەو كەسەش كە بە ناوی دا بڕوات حەق نیە هیچ لە گەڵ خۆیدا ببات بە بێ ئیجازەی خاوەنەكەی.

(١٤٢) هەروەك چۆن درەختانی دروستكردوە كە سێبەرمان بۆ دروست دەكەنو هەندێكیان دەخشێن بە سەر زەوی داو بەروبومان پێ دەدەن ، هەروەها لە ناو حەیواناتەكانیشدا هەندێكیان بار هەڵگرەو بارمان بۆ هەڵدەگرێت وەك حوشترو ئەسپو هێسرو كەر ، وە هەندێكیشیان بچوكن لەخوریو لە موەكانیان فەرش دروست دەكرێتو وەك ڕاخەر ڕادەخرێنو سەر دەبڕێنوسود لە گۆشتەكانیان وەردەگیرێو ئەمە دوو شتی دژی یەك نیەودەگونجێن هەر بۆ یەكێكیان بشێ وەك كەر و بزنومەڕ یان بۆ هەردووكیان وەك حوشترو ئەسپ ، ئینجا دەفەرموێ: بخۆن لەوەی كە خوا كردویەتی بە ڕۆزیتانو دوای هەنگاوەكانی شەیتان نەكەونوبەو جۆرەی كە شەیتان پێتان دەڵێ ئاوەها ڕەفتار نەكەن چونكە بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێكی ئاشكرایە. جا ئەگەر مرۆڤ عاقڵ بێت دوای دوژمنی خۆی ناكەوێتو بە گوێی ناكات بەڵكو ئەگەر ئامۆژگاری باشیشی بكات هەر لێی بە گومانە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ :

ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ قُل لَّآ أَجِدُ فِى مَآ أُوحِىَ إِلَىَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٍ يَطْعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيْتَةً أَوْ دَمًا مَّسْفُوحًا أَوْ لَحْمَ خِنزِيرٍ فَإِنَّهُۥ رِجْسٌ أَوْ فِسْقًا أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾

﴿١٤٣﴾ حەیوانەکان هەشت جۆرن بزنو مەڕو حوشترو مانگا کە چوارن هەر یەکەیان دوو جۆرە نێرومێ کەواتە هەشت جۆرن، جا باسیان دەکاتودەفەرموێ: لە مەڕدا دوان یەکێکیان نێرو یەکێکیان مێ وە لە بزنیشدا دوان پێیان بڵێ: ئایا خوا نێرەکانیانی حەرام کردوە یان مێیەکانیان؟ یان ئەوەی کە لە ناو سکی ئەو دوو مێیانە دایە حەرامی کردوە؟ دەی ئەگەر راست دەکەن لە مبارەوە زانیارییەکم بۆبێنن کە تێیدا نوسرا بێت کە خوا یەکێك لەمانەی حەرام کرد بێت ، ئەی چۆن لە خۆتانەوە ئەو شتانە حەرام دەکەن؟ واتە: حەرامو حەڵاڵ کردن تەنها بە دەست خوایەو کەس مافی حەرامو حەڵاڵ کردنی نیەو هەر کەسێك ئەو مافە بۆ خۆی دابنێ لە ناو چوو فەوتاوە ، چونکە یان ئیدعای خوایەتی دەکات یان درۆ بە دەمی خواوە دەکات ئەگەر بڵێ: خوا وای فەرموە، یان خوا بە نەزان دەزانێ کە هەر سێ بۆ چونەکە کوفرەو کابرا لە ئایین دەردەچێت هەرچەند لافی بیروباوەڕو خواناسیش لێبدات ، ئینجا باسی چوار جۆرەکەی ترمان هەر بەو شێوازەی سەرەوە بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٤٤﴾ لە حوشتران دووان نێر مێو لە ڕەشە ولاخیش دووان نێر ومێ گاو مانگا پێیان بڵێ: ئایا خوا نێرەکانیانی حەرام کردوە یان مێیەکانیان؟ یان ئەوانەی کە لە سکی ئەو دوو مێیانەدایە؟ ئا دەی چ بەڵگەیەکتان هەیە بیهێنن. یان ئایا ئێوە لەوێ ئامادە بوون کاتێ کە خوا ئەو وەسیەتەی کردوە؟ پرسیارێکی ئینکاریە، واتە: نەخێر لەوێش نەبوون. ئەی ئیتر بێجگە لە درۆ چ بەڵگەیەکتان هەیە؟ دەی کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە ئاوا درۆ بە دەمی خواوە بکات تا خەڵکی بە نەزانانە لابدات لە ڕێگەی خوا؟ بە راستی ئەمانە ستەمکارن بە بێشك کە خوایش ڕێنمایی گەلی ستەمکاران ناکاتو هەروا لەو بێ بەختیوسەر شۆڕیەدا دەمێننەوە، چونکە مرۆڤ بۆ زانینی حەرامو‌حەڵاڵ بێجگە لە دوو ڕێگە ڕێگایەکی تری نیە یان بە هۆی پێغەمبەرانەوەیە یان ڕاستەخۆ خوا پێی بفەرموێ یەکەمیانی بە ﴿نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ ...﴾ الأنعام: ١٤٣/ دەی ئەگەر راست دەکەن لە مبارەوە زانیارییەکم بۆبێنن کە تێیدا نوسرابێت کە خوا یەکێك لەمانەی حەرام کردبێت، ﴾ هەڵوەشاندنەوە دووهەمیانیشی بە ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَٰذَا ..﴾ الأنعام: ١٤٤/ یان ئایا ئێوە لەوێ ئامادە بوون کاتێ کە خوا ئەو وەسیەتەی کردوە؟﴾

ئینجا ﷻ لە پاش ئەوەی کە بت پەرستانی بە درۆ خستنەوە لە بڕیاری حەرامو‌حەڵاڵ دا ئەوسا باسی ئەو شتانە دەکات کە حەرامەو دەفەرموێ:

﴿١٤٥﴾ ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: من نابینم لەوەی کە وەحی کراوەتە لای من هیچ شتێك حەرام بوبێت لە سەر بخۆرێك کە خواردنێك بخوات مەگەر یەکێك لەم چوار شتانەبێ:

یەکەم - حەیوانێك مردار بو بێت .

دووهەم - خوێنی ڕەوان نەك خوێنێ کە بە گۆشتەوە بێت چونکە وشەی (مسفوح) ئەوە دەگەیەنێ.

سێهەم - حەرامە گۆشتی بەراز کە بەبێشك ئەوە شتێکی پیسە. دەگونجێت ئەمە دووپات کردنەوە بێت بۆ گۆشتی بەراز یان بۆ هەرسێکیان.

چوارەم - سەربڕینی حەیوان بۆ غەیری خوا ، یان ئەو حەیوانە سەر ببڕن و ناوی بێجگە لە خوا ی لەسەر ببرێت ، جا چ ناوی خوا هەر نەبەن لە گەل ناوێکی تر یان ناوی خواوکەسێکی تری لە سەر ببەن، هەردووکیان هەر تاوانەو گۆشتی ئەو حەیوانە حەرامەو نابێ بخورێت ئەمانە چوار شت بوون کە قەدەغە کراونوحەرامە خواردنیان لە کاتی ئاسایدا بەڵام ئەگەر مرۆڤ ناچار بوو بۆ خواردنیان ئەوە چاوپۆشی لێ کراوە . وەك خوا دەفەرموێ: جا کەسێك کەمەبەستی حەرام خواردنی نەبێو ناچار بێت بە مەرجێك دەست درێژی کار نەبێتو لە سنوری پێویستی تێپەڕ نەکات ئەوە لەو گۆشتە قەدەغە کراوانە بخوات قەیناکە، بەم شێوەیە داناییومیهرەبانی خوا سەبارەت بە بەندەکانی لەمانگی چواردە ئاشکراتر دەبێت هەر وەك دەفەرموێ: بێگومان

فَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل رَّبُّكُمْ ذُو رَحْمَةٍ وَٰسِعَةٍ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُهُۥ عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٤٧﴾ سَيَقُولُ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَآ أَشْرَكْنَا وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن شَىْءٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ حَتَّىٰ ذَاقُوا۟ بَأْسَنَا ۗ قُلْ هَلْ عِندَكُم مِّنْ عِلْمٍ فَتُخْرِجُوهُ لَنَآ ۖ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنْ أَنتُمْ إِلَّا تَخْرُصُونَ ﴿١٤٨﴾ قُلْ فَلِلَّهِ ٱلْحُجَّةُ ٱلْبَٰلِغَةُ ۖ فَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٤٩﴾ قُلْ هَلُمَّ شُهَدَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ يَشْهَدُونَ أَنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَ هَٰذَا ۖ فَإِن شَهِدُوا۟ فَلَا تَشْهَدْ مَعَهُمْ ۚ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ وَهُم بِرَبِّهِمْ يَعْدِلُونَ ﴿١٥٠﴾ ۞ قُلْ تَعَالَوْا۟ أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ ۖ أَلَّا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا ۖ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَوْلَٰدَكُم مِّنْ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكُمْ وَإِيَّاهُمْ ۖ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ ۖ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾

پەروەردگارت لێ بوردەیە لەو کەسانەی کە لەو بارەوە تاوانێکیان کردبێتو خاوەن سۆزەو ناهێڵێت لەبرساو لە تەنگانەدا بمرنو مەیدانیان بۆ فرەوان دەکات ، جا پێویستەلە سەر موسڵمانان کەلەکاتی ئاسایدا ئەو گۆشتە نەخۆن، وە ناوی بێجگە لە خوا لە کاتی سەر بڕینی حەیواناتو شتی تردا نەبەنو خۆیان دوچاری شیرك نەکەنو گۆشتی حەرام دەر خواردیماڵو منداڵی خۆیانو خەڵکیش نەدەن ، یەکێك لەو شتە خراپانە سەربڕینی حەیواناتە لە بەر پێی گەورە یان پیاو چاکدا ئەمە ڕەوشتێکی ئیسلامی نیەو پێویستە موسڵمانان خۆیانی لێ دور بگرن ، وە ئەگەر لەکاتی سەربڕینیدا سەر بڕ ناوی کابرا ببات گۆشتی ئەو حەیوانە حەرامەو ناخورێتوسەربڕ تاوانبارە . ئینجا خوای داناو ئاگا باسی هەندێ شتی حەرامی گەلانی پێشومان بۆ دەکاتودەفەرموێ :

﴿١٤٦﴾ ئێمە حەرامان کرد لە سەر ئەوکەسانەی کە جولەکە بون ئەوەی کە خاوەنی نینوك بێت هەروەها لە مانگاو لەمەڕ قەدەغەمان کرد لێیان بەزەکانیان (چەوری) کە شتێکی ناسراوەو دەیکەن بە ڕۆن مەگەر ئەوەی کە بە گۆشتی پشتیانەوە بێت یان بە گۆشتی ریخۆڵەیانەوە بێت یان ئەوەی کەتێکەڵاو بە ئێسقانەکانیان بوبێت کە ئەوانەمان چاو پۆشی لێ کردوە بۆیان . جا ئەوە نەبێ کە ئێمە ئەمانە بە شتێکی خراپ بزانین بۆیە قەدەغەمان کردوە، نەخێر بەڵکو ئەوە تۆڵە سەندنەوەیەکی ئێمە بوو لێیان بە هۆی لاساریو ستەمکاریانەوە ، بێگومان ئێمە لە راستگۆیانینوراست دەڵێینو حوکمەکانمان ڕاستن، وە هەر ئەمانەمان قەدەغە کردوە لە جوەکانو بڕیاری ئێمە دادگەرانەیە.

﴿١٤٧﴾ جا ئەگەر پاش ئەمە ئەوان هەر باوەڕت پێ ناکەن دەی تۆ بڵێ: پەروەردگارتان خاوەنی ڕەحمەتێکی فرەوانەو بەرەو سۆزو میهرەبانی خوا بانگیان بکە ، واتە: ئەگەر ئەوان هەر باوەڕت پێناکەن تۆ نەچی جنێویان پێ بدەیو لەعنەتیان لێ بکەی تۆ دەبێ زۆر بە نەرمیو میهرەبانیەوە بەرەو ئایینی خوا بانگیان بکەی. ئا ئەمەیە ڕەوشتی قورئانو ئەخلاقی پێغەمبەرمانﷺ جا ئەگەر کابرای موسڵمان ڕاست دەکاتو پەیڕەوی قورئانو پێغەمبەرەﷺو بانگ کەرە بۆ ڕێبازی خوای داناو ئاگاو میهرەبان دەبێ بەو شێوەیە لە ناو خەڵکدا ڕەفتار بکات، جا با ستەمکارانیش بزانن کە تۆڵەو رقی خوا زۆر سەختەو کاتێ ویستی تۆڵە بکاتەوە کەس ناتوانێ ڕێگای بگرێت وەك دەفەرموێ: خۆ هەرگیز سزای خوا بەرگری ناکرێت لە گەلی ستەمکار ، واتە: دڵنیا بن کە گەلی ستەمکار دوچاری سزای خوا ئەبنو هەرگیز رزگار نابنو پەنا نادرێن مەگەر پەشیمان ببنەوە پێش هاتنی سزاکەیان ، وە با هاوەڵ دانەران چاکیش بزانن کە ئەم گومان دروستکردنانە هیچ سودێکیان پێ نادات.

﴿١٤٨﴾ بەم زوانە ئەمانەی کە هاوبەشیان بۆ خوا داناوە دەڵێن: ئەگەر خوا مەیلی لێبوایە نە ئێمەو نە باو باپیرانمان هاوبەشمان بۆ خوا دانەدەنا ، چونکە خوا خاوەن دەسەڵاتەو دەیتوانی بەرگریمان بکات جا مادام بەرگری نەکردوین ، دیارە خوا خۆی بەم ئیشەمان رازیە ، هەروەها دەڵێن: خۆ هیچ شتێکمان حەرام نەدەکرد ، واتە: ئەمە ئیرادەی خوای لە سەرە وەك ئێستا هەندێك لە نەفامەکان کاتێ کەتاوانێ دەکەنو پێیان بوترێت: بۆ ئەو تاوانە دەکەن هەمان قسەی کۆن دووبارە دەکەنەوە، واتە: خۆیان دەبەستن بە قەدەرەوە دەڵێن: خوا خۆی پێی خۆشەو لەسەر ئێمەی نوسیوە ، بۆیە ئێمەش دەیکەین وەڵامی ئەم نەزانانە زللە یان شەقێکە ونابێ وەڵامت بدەنەوە چونکە بە قسەی خۆیان خوا پێی خۆشبوە لێی بدەیت وە لە سەری نوسیوی ئایا بەم وەڵامە لێت رازی دەبن؟ ئەگەر رازی نابن، بۆ؟ بانێکەو دوو هەوا؟ ئینجا ﷲ دڵی پێغەمبەرمانﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ: هەر ئاوەها بۆ ئەوانەی کە بێ باوەڕ بون لە پێش ئەمانیشەوە ، واتە: ئەم قسەیە قسەیەکی کۆنەو بەرهەمێکی نەبوە بۆ پێشینەکانیان تا بۆ ئەمانیش بەرهەمو سودێکی ببێت بەڵێ پێشینەکانی ئەوان وایان وت: هەتا سزای ئێمە یان چەشت، جا ئەگەر ئەو بەڵگەیە شتێکی بە سود بوایە نەدەبو پێشوەکانی ئێوە سزایان بدرایە، پێیان بڵێ:

ئایا هیچ زانینێکتان لایە لەم بارەیەوە ئەگەر لاتانەو راست دەکەن دەی بۆمان بهێنن، نەخێر هیچتان لا نیە بەڵکو ئێوە هەرپەیڕەوی لە گومان دەکەن و بێجگە لە گومان هیچتان لا نیە، وە ئێوە هەر درۆ هەڵدەبەستن .

(١٤٩) پێیان بڵێ: تەنها بۆ خوایە بەڵگەی بێ نیهایەتو راستودروست خوا دنیای بۆ تاقیکردنەوە دروستکردوەو ئیختیاری بە مرۆڤ داوە ئەگینا ئەگەر خوا ئارەزۆی بکردایە هەموتانی رێنمایی دەکردوباوەڕتان دەهێنا ، بەڵام خوا ئەم ئارەزۆە ناکات چونکە سودی هاتنی ئێمە بۆ دنیا نامێنێ.

(١٥٠) پێیان بڵێ: بانگیان بکەن ئەو شایەتانەتان کە شایەتی بدەنوبڵێن: بە راستی خوا ئەمەی حەرام کردوە ، واتە: هەر کێ شایەتیان بۆ ئەدات با بێت شایەتیان بۆ بدات ، ئەوسا ئەگەر هاتو شایەتیشیان دا تۆ هەرگیز شایەتیان لە گەڵدا مەدەو لە گەڵیاندا مەبە ، چونکە درۆ دەکەن و هەرگیز دوای ئارەزۆاتی ئەو کەسانە نەکەوی کە بێباوەڕن بە نیشانەکانی ئێمەو ئەوانەی کە باوەڕیان بە رۆژی دوای نیە. لەحاڵێکدا کەهەر ئەوانن هاوتا دادەنێن بۆ پەروەردگاری خۆیان. ئا بەم شێوەیە خوای دانا دەمکوتی بێ باوەڕان و هاوەڵدانەرانی کردو هەمو بەهانەیەکی برین و بەدرۆی خستنەوە ئینجاﷲ لەم چەند ئایەتەی دواییە دا نۆ شتی خراپ باس دەکات تا خاوەن باوەڕان لێی دور کەونەوەودەفەرموێ:

(١٥١)پێیان بڵێ وەرن تا بخوێنمەوە بۆتان ئەوەی کە پەروەردگارتان حەرامی کردوە لێتان ، ئیتر لە خۆتانەوە قسەی درۆو ناڕەوا نەکەن ئەگەر خواتان خۆش دەوێ و پەیڕەوی راستەقینەی ئەون؟ وەرن ئەمە ئەو شتە قەدەغانەن. **یەکەم:** دەبێ هیچ هاوەڵێك بۆ خوا دانەنێن. **دووهەم:** لە گەڵ دایكوباوکتاندا چاکە بکەن. **سێهەم:** منداڵەکانتان نەکوژن لە بەر کەمدەستیونەداری خۆ هەرئێمەین کەرۆزی ئێوەو ئەوانیش دەدەین. **چوارەم:** نزیکی داوێن پیسی نەبنەوەو زینا نەکەن، بەڵام دەفەرموێ: نزیکی مەکەونەوە واتە رێگاکانی پێش زینا نەگریت وەك تەماشا کردنوقسە کردن. واتە ئیسلام ئەوتاوانە پیسە لەریشەوە هەڵدەکێشێ. **پێنجەم:** کەس نەکوژن بەناڕەوا. ئا ئەمەی کە وترا ئامۆژگاری خوایە بۆ ئێوە بەڵکو ئێوەش بفامن و بزانن چی دەکەنوبیر بکەنەوە لە ماڵی ئایندەی خۆتان و بەتاوانکردن ئەو ماڵە لەخۆتان خراپ نەکەن. کوشتنی بە رەوا لەوانە، زیناکارێك کە سوودی لەهاوسەری حەڵاڵ وەرگرتبێ. وەلەوانە ، کەسێ کە کەسێك بە دەستی ئەنقەست بکوژێت. وەلەوانە ، پاشگەز بونەوە لە ئایین و هێرشکەرێك بۆسەر بێ تاوانێك و باغی

یان باغیانێ کە ئامادەی ئاشتی نەبێت ، جنێودەرێك بەخواو بەئایینو بەپێغەمبەرێك لەپێغەمبەران و چەند کەسانێکی تر کە لەپەڕاوە فقهیەکاندا بەدرێژی باسکراوە . جا یەکەم حەرامێ کە خوا لێرەدا باسیکرد هاوەڵ دانانە ، چونکە ئەو لە هەمو گوناهێك گەورەترە چونکە دەگونجێت ﷲ لە هەمو گوناهێك بە بێ تەوبە خۆش ببێت بەڵام لە هاوەڵ دانان بە بێ تۆبە قەت خۆش نابیت ، وەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: { مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِا شَيْئًا دَخَلَ الْجَنةَ /مسلم/هەر کەسێ بمرێ و هاوبەشی بۆخوا دانەنابێ بێگومان دەچێتە بەهەشتەوە} وە هەروەها پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: { مَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِا شَيْئًا دَخَلَ النارَ /مسلم/هەر کەسێ بمرێ و هاوبەشی بۆ خوا دانا بێ بە بێگومان دەچێتە ناو ئاگرەوە}وە لە بارەی دایك و باوکەوە دەیان ئایەتی ترو سەدان فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ هەیەو لە بارەی منداڵ کوشتنەوە ئەم فەرمودەی پێغەمبەرمانە کە لە وەڵامی عەبدوڵا ی کوڕی مەسعود دا هاتوە کە دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کام تاوان لە هەموان گەورەترە؟ فەرموی: { أَنْ تَجْعَلَ لِلهِ نِدا وَهُوَ خَلقَكَ قُلْتُ إِن ذَلِكَ لَعظِيمٌ قُلْتُ ثُم أي قَالَ وَأَنْ تقْتلَ وَلَدَكَ تخَافُ أَنْ يطعَمَ مَعكَ قُلْتُ ثُم أي قَالَ أَنْ تُزَانِيَ حَلِيلةَ جَارِكَ/البخاری/ ئەوەیە کە تۆ هاوبەش دابنێی بۆ خوا لەحاڵێکدا کە هەر ئەو زاتەیە تۆی دروستکردوە. وتم بەراستی ئەوە تاوانێکی گەورەیە لە پاشا وتم:پاش ئەو؟ فەرموێ: ئەوەیە کە تۆ منداڵی خۆت بکوژی لە ترسی ئەوەی کەخواردنت لە گەڵدا بخوات. لە پاشا وتم چ تاوانێکی تر لە پاش ئەوانە گەورەترە؟ فەرموی: ئەوەیە کە زینا بکەیت لە گەل ژنی دراوسێتدا} پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {لَا تَزَالُ أُمتي بِخَيْرٍ مَا لَمْ يَفْشُ فِيهِمْ وَلَدُ الزنَا فَإِذَا فَشَا فِيهِمْ وَلَدُ الزنَا فُيوشِكُ أَنْ يَعُمهُمْ ا عَز وَجَل بِعقَابٍ/رواه أ دوحسنه الألبا / هەمیشە ئەم گەلە لەخۆشیدایە هەتامنداڵی زۆڵی تێدا زۆر نەبێت جا هەر کاتێ منداڵی زۆڵی تێدا زۆر بو ، ئیتر نزیکە کە خوای دەسەڵاتداری بەشکۆ هەمویان سزابدات}ئەمە پاڵپشتێکە بۆئەو ریوایەتەی کە هاتوەودەفەرموێ: { لە هەر وڵاتێکدا زینا ئاشکرا بو کوشتار زۆر دەبێت و دوچاری نەخۆشیەك دەبن کە بابو باپیرانتان ئەو نەخۆشینەیان هەرگیز نەبینیوەو نەبیستووە} کە ئەمرۆ دەبینین کە هەمان نەخۆشی نەبینراو ونەناسراو بە ناو نیشانی (أیدز) بڵاو بوەتەوەو وڵاتی کوفر بە دەستیەوە دەناڵێنێ و بە سایەی ئەوەی کە هێشتا کەمێك لە خووڕەوشتی ئیسلامی لە وڵاتانی ئیسلامیدا ماوەتەوە لەم وڵاتانەدا بەو شێوەیە پەیدا نەبوە بەڵام پەروەردە کراوەکانی غەربو شەرق بە ناوی ئازادییەوە دەیانەوێ هەمان بێ رەوشتی لەم وڵاتانەشدا رەواج پێ بدەن و بڵاوی بکەنەوە تا ئەمانیش دوچاری هەمان چارەنوس ببنەوە کە خۆیان بەدەستیەوە

وَلَا تَقْرَبُوا مَالَ الْيَتِيمِ إِلَّا بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُ ۖ وَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ بِالْقِسْطِ ۖ لَا نُكَلِّفُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۖ وَإِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُوا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۖ وَبِعَهْدِ اللَّهِ أَوْفُوا ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٢﴾ وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾ ثُمَّ آتَيْنَا مُوسَى الْكِتَابَ تَمَامًا عَلَى الَّذِي أَحْسَنَ وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لَّعَلَّهُم بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ يُؤْمِنُونَ ﴿١٥٤﴾ وَهَٰذَا كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ مُبَارَكٌ فَاتَّبِعُوهُ وَاتَّقُوا لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٥٥﴾ أَن تَقُولُوا إِنَّمَا أُنزِلَ الْكِتَابُ عَلَىٰ طَائِفَتَيْنِ مِن قَبْلِنَا وَإِن كُنَّا عَن دِرَاسَتِهِمْ لَغَافِلِينَ ﴿١٥٦﴾ أَوْ تَقُولُوا لَوْ أَنَّا أُنزِلَ عَلَيْنَا الْكِتَابُ لَكُنَّا أَهْدَىٰ مِنْهُمْ ۚ فَقَدْ جَاءَكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَّبَ بِآيَاتِ اللَّهِ وَصَدَفَ عَنْهَا ۗ سَنَجْزِي الَّذِينَ يَصْدِفُونَ عَنْ آيَاتِنَا سُوءَ الْعَذَابِ بِمَا كَانُوا يَصْدِفُونَ ﴿١٥٧﴾

دەناڵێنن؟! لە بەر ئەوە داوا لەبراو خوشکانی وڵاتی ئیسلامیم دەکەم کە فریا کەونو پێشگیری لەو بێ ڕەوشتیو بێ بەندو باریە بکەن بە گەڕانەوە بۆ لای ئایینی ئیسلامو فریو نەخواردن بەقسەی زلو بریقەداری دوژمنانی ئیسلام ئەگینا لە هەردوو ژیاندا دوچاری بەلا دەبن.

ئینجا تاوانی **شەشەم** ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ :

﴿١٥٢﴾ نزیکی ماڵی هەتیو نەکەونەوە مەگەر بە شێوەیەکی چاکترو بۆ پارێزگاری لە ماڵەکانیان بێ هەتا ئەو هەتیوە باڵغ دەبێت . ئینجا ماڵەکەی ئەدرێتەوەو هەرچی بکات لە دەعوەتو خێرو چاکە خواردنی دروستەو بە هەتیو دانانرێت هەتیو ئەو کەسەیە کە باوکی بمرێتو باڵغ نەبو بێت. ئینجا دەفەرموێ: با پێوانەو کێشانەکانتان تەواو دادپەروەرانە بێت ، واتە: چۆنی بۆ خۆتانی دەکێشن ئاوەهاش بۆ خەڵکی بکێشن کە ئەمە **حەوتەم** تاوانە یان حەوتەم ڕێنماییو ڕێ پیشاندانمانە. ئێمە داوا ناکەین لە هیچ مرۆڤێك مەگەر بە گوێرەی توانای خۆی کە هەر کەس بە گوێرەی توانای خۆی پێویستە هەوڵ بدات بۆ ئەنجام دانی ئیشی چاکو بەرگری کردن لە ئیشی خراپ.

بۆ**هەشتەم** ڕێنمایی دەفەرموێ: وە هەر کاتێك قسەیەکتان کردو بڕیارێکتاندا با دادپەروەربن ئەگەر چی خزمی نزیکتان بێ، واتە: قسەو بڕیارەکە دژی بێ یان بە قازانجی بێت نابێ خزمایەتیو دوورو نزیکی کاری تێ بکات. **نۆهەم** ئامۆژگاری دەفەرموێ: وە ئەو عەهدو پەیمانەی کە داوتانە بە خوا جێ بە جێی بکەن ، ئەویش بەوە دەبێت کە بە گوێی خوا بکەن لەو شتانەی کە داواتان لێ دەکات یان بەرگریتان لێ دەکاتو بە گوێرەی قورئان وفەرمودەکانی پێغەمبەرمانﷺ بجولێنەوە. ئا ئەوانەی کە باسکرا بۆتان خوا ئامۆژگاری تان دەکات بەڵکو ئێوەش بیر بکەنەوەوڕێگای ڕاست بگرنو فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی ئەنجام بدەنوبگەن بە خۆشبەختی هەردوو ژیان لە پاشان خوا دەفەرموێ:

﴿١٥٣﴾ بێگومان ئا ئەمە ڕێگا ڕاستەکەی منە دەی دوای بکەونو بەو شێوەیەی بۆمان باس کردن ئیشی پێبکەنو دوای ڕێگاکانی تر نەکەون ، چونکە ئێوە پارچە پارچە دەکاتو دورتان دەخاتەوە لە ڕێگای خوا ئا ئەوەی کە پێتان وترا: ئامۆژگاری پەروەردگارتانە بۆ ئێوە بەڵکو ئێوەش بترسن لە خواو خۆتان بپارێزن لە تاوان. دەرکەوت کە ئیسلام تەنها یەك ڕێگایەو نابێت بە دووانو سیان بەڵام ڕێبازەکانی تر دەگونجێت هەزاران ڕێگا بێت، چونکە ڕێگای ئارەزۆکاریو نەفسەو هەر کەسێ ئارەزۆیەکی تایبەتی خۆی هەیەو بە جۆرێك بیر دەکاتەوە کە جیاوازە لەوانی تر. ئینجا ﷻ پاش باسی قورئان وەسفی تەوراتو پێغەمبەرەکەی دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٥٤﴾ لە پاش ئەوەی کە باسمان کرد بۆت ، بزانە کە ئێمە کتێبێکی تەواوو ڕێكوپێکمان دا بە موسا بۆ ئەو کەسەی کە چاکترین ئیشی دەکرد وەك پاداشێك ، وە لەو کتێبەدا ئەوەی پێویست بێ لە هەمو بارێکەوەو بۆ هەمو شت ڕوون کراوەتەوەو ڕێنمایی کەرو مایەی خەیرو سۆز بو ، بەڵکو ئەوانیش باوەڕ بە ڕۆژی دوایوگەیشتن بە پەروەردگاریان بکەن. قەتادە دەڵێ : هەر کەسێ ئیشی چاکتر بکات لە دنیادا ڕۆژی دوای بۆی تەواو دەکرێت. ﴿الذی﴾ دەگونجێ بە مانای ﴿الذین﴾ بێت. ئینجا باسێکی تری قورئان دەکاتودەفەرموێ:

﴿١٥٥﴾ خۆ ئەمە قورئانێکی پیرۆزەو ئێمە ڕەوانە مان کردوەو محمدﷺ لە خۆیەوە نەی وتوە ، دەی ئێوەش دوای بکەونو پەیڕەوی بکەنو لە خوا بترسن بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت، چونکە هەرچی خەیرو چاکەیە لەپەیڕەوی ئەم قورئانەدایە.

﴿١٥٦﴾ وا ئێمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کرد نەك بڵێن: کتێب هەر تەنها بۆ ئەو دوو تایفەی پێش ئێمە کە جولەکەو گاورە هاتووەو بەڕاستی ئێمە هیچ لەو کتێبانەی ئەوان نازانین.

(١٥٧) یا بڵێن: ئەگەر ئەو کتێبەش رەوانە بکرایە بۆ سەر ئێمە بێگومان ئێمە لەوان چاکتر رێگای راستمان دەگرتو باشتر پەیرەویمان دەکرد ، دەی وا هاتە لاتان بەڵگەیەکی روون لە لایەنی خوای خۆتانەوەو رێنمایی کەرو مایەی بەرەکەت و سۆزە ، جا ئیتر کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە بێ باوەڕ بێت بە نیشانەکانی خواو پشتی تێ بکاتو گاڵتەی پێ بکات؟ با بزانن کە ئەمانە لە دەست تۆڵەی خوا دەرناچن وەك دەفەرموێ: بەم زوانە تۆڵە دەسێنین لەو کەسانەی کە پشت دەکەنە نیشانەکانی ئێمەو پێی پێدەکەنو گاڵتەی پێ دەکەن بە خراپترین سزا بە هۆی ئەو گاڵتەو پشت تێ کردنەی کە دەیانکرد.﴿ وَصَدَفَ ﴾ واتە،پشتی تێکرد.

(١٥٨) ئایا ئەوان چاوەڕێ دەکەن بێجگە لەو کاتەی کە فریشتەکان دێنە لایان یان پەروەردگاریان دێتە لایان لە رۆژی قیامەتدا یان هەندێ نیشانەکانی خوا بێت بەر لە هاتنی رۆژی قیامەت، جا ئەو رۆژەی کە هەندێك لە نیشانەکانی پەروەردگارت هات هیچ سودێك نادات بە هیچ نەفسێك بیروباوەڕەکەی مادام لە پێشدا باوەڕی نەهێنا بێ‌و کرداری چاکی لەو تەمەنەی باوەڕداری دا ئەنجام نەدابێت ، پێیان بڵێ: ئێوە چاوەڕێ بکەنو ئێمەش چاوەڕێ دەکەین. پێغەمبەرمانﷺ لە بارەی ئەو نیشانانەی پێش هاتنی قیامەتدا دەفەرموێ: { لَا تقُومُ الساعَةُ حَتى تطْلُعَ الشمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا فَإذَا طَلَعَتْ وَرَآهَا الناسُ آمَنُوا أجْمَعُونَ وَذَلِكَ حِـ لَا يَنفَعُ نفْسًا إ أنها ثُم قَرَأَ الْآيَةَ /البخاری/ قیامەت نایەت هەتا رۆژ لە رۆژئاواوە هەڵ نەیەت ، جا هەر کاتێ رۆژ لەوێوە هەڵهات هەمو خەڵك باوەڕ دێنن ، جا ئەوە ئەو کاتەیە کە هیچ سودێ نادات بە هیچ کەسێك لەو کاتەدا باوەڕەکەی‌و ئینجا پێغەمبەرمانﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە} هەروەها پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: { لَنْ تقُومَ الساعَةُ حَتى يَكُونَ قبْلَهَا عَشْرُ آياتٍ طُلُوعُ الشمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَخُرُوجُ الدابةِ وَخُرُوجُ يَأجُوجَ وَمَأجُوجَ وَالدجالُ وَعِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ وَالدخَانُ وَثَلَاثَةُ خُسُوفٍ خَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَخَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَآخِرُ ذَلِكَ تخْرُجُ نارٌ مِنْ الْيَمَنِ مِنْ قعْرِ عَدَنٍ تسُوقُ الناسَ إلَى الْمَحْشَرِ / مسلم وابوداود واللفظ له/ واتە: قیامەت نایەت هەتا دە نیشانە نەیەت لەپێشیدا ،

**یەکەم**: هەڵهاتنی رۆژ لە رۆژئاواوە.

**دووەم**: دەرچونی حەیوانێك کە قسە لە گەڵ خەڵکدا دەکات.

**سێهەم**: هاتنی یاجوجوماجوج.

هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ رَبُّكَ أَوْ يَأْتِىَ بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ ۗ يَوْمَ يَأْتِى بَعْضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَٰنُهَا لَمْ تَكُنْ ءَامَنَتْ مِن قَبْلُ أَوْ كَسَبَتْ فِىٓ إِيمَٰنِهَا خَيْرًا ۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٥٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا لَّسْتَ مِنْهُمْ فِى شَىْءٍ ۚ إِنَّمَآ أَمْرُهُمْ إِلَى ٱللَّهِ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿١٥٩﴾ مَن جَآءَ بِٱلْحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشْرُ أَمْثَالِهَا ۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١٦٠﴾ قُلْ إِنَّنِى هَدَىٰنِى رَبِّىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ دِينًا قِيَمًا مِّلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۚ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٦١﴾ قُلْ إِنَّ صَلَاتِى وَنُسُكِى وَمَحْيَاىَ وَمَمَاتِى لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ ۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٦٣﴾ قُلْ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِى رَبًّا وَهُوَ رَبُّ كُلِّ شَىْءٍ ۚ وَلَا تَكْسِبُ كُلُّ نَفْسٍ إِلَّا عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿١٦٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ ٱلْأَرْضِ وَرَفَعَ بَعْضَكُمْ فَوْقَ بَعْضٍ دَرَجَٰتٍ لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۗ إِنَّ رَبَّكَ سَرِيعُ ٱلْعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿١٦٥﴾

**چوارەم**: هاتنی دەجال کە لافی خوایەتی لێ دەداتو چاوێکی کوێرە بە رواڵەت هەرچی دەیەوێ دەیکاتو هەمو جێگایەکیش دەگەڕێ لەم خاکەی ئیسلامدا بێجگە لە مەکەو مەدینەوقودس. چل رۆژ دەمێنێ کەدرێژی رۆژی یەکەمی یەك ساڵە و رۆژی دووەمی یەك مانگەو رۆژی سێهەمی هەفتەیەکەو باقی رۆژەکانی کە هەموی سی‌و حەوت رۆژە وەك ئەمرۆژەی خۆمانە نزیکەی ساڵێك‌ودوو مانگ‌ونیو دەکات.

**پێنجەم**: دابەزینی عیسای کوڕی مەریەم .

**شەشەم**: دوکەڵێکی گەورە.

**حەوتەم‌وهەشتەم‌ونۆهەم**: سێ رۆچۆنی زەوییە یەکێکیان لە رۆژئاواوە دەبێ‌و یەکێکیان لە رۆژهەڵاتەوە دەبێ و ئەوی تریان لە نیو دورگەی عەرەبدا دەبێ.

**دەهەم**: ئاگرێکە کە لە قوڵایی عەدەنەوە دێ‌وپاڵ بە خەڵکەوە دەنێ یان کۆی دەکاتەوەو شەو لە تەك خەڵکا دەوەستێت‌و پێش نیوەروانیش بۆ ئەوەی خەڵکی ئیسراحەت بکات‌و پشویەك بدات دەوەستێت ، جا قورئان دەفەرموێت کەسانێك کە باوەڕیان نەهێنا بێ تا رۆژ دەگەڕێتەوە ئیتر باوەڕ هێنانی سودی نابی کە ئاخری ئەو دەنیشانانەیە.

(١٥٩) بە ڕاستی ئەو کەسانەی کە ئایینەکەی خۆیان بەش بەش دەکەن وەك ئەمڕۆی ئێمە یان مرتد دەبنەوە لە دینەکەیانو گوێی پێ نادەنو دەبن بە حیزب حیزبودەستە دەستە تۆ لەوان نیتو خەفەتیان لێ مەخۆ ولێیان گەڕێ بۆ ئێمەو حیسابی ئەوان تەنها لای اللە یە لە پاشان هەواڵیان پێ دەدات بەو کارە خراپانەی کەدەیکەن. موسڵمان وریابەو حیزبایەتی  هاوەڵ دانانە بۆ اللە بەناو خەمخۆری بۆئایین لەرێبازی اللە لات نەدات.

(١٦٠) ئەو کەسەی کە چاکەیەك دەکات بۆ ئەو هەیە پاداشتی دە بەرامبەری ئیشە چاکەکەیو هەر کەسێکیش خراپەیەك بکات خوا تۆڵەی لێ ناسێنێت مەگەر بە وێنەی خراپەکەیوهیچی لێ زیاد ناکات ، ئەمەش گرنگترین بەڵگەیە لە سەر سۆزو میهرەبانی خوا بەرامبەر بە بەندەکانی ، چاکەیەك لای خوا یەك بە دەیە بەڵام خراپە هەر وەك خۆی دەبێو هیچی لێ زیاد ناکرێت. وەك ئەفەرموێ: ئەوسا ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت. بۆ زانین ئەو کەسەی کەواز لە خراپە دەهێنێت بە سێ شێوەیە:

**یەکەم**: وازی لێ دەهێنێ لە بەر خاتری خوا ئەمە چاکەیەکی بۆ دەنوسرێت لە سەر نیەتەکەی.

**دووهەم**: وازی لێ دەهێنێ چونکە لە بیری چووە ئەمە نە چاکەو نەخراپەی بۆ نانوسرێت ، چونکە نیەتی چاکەی نەبووە ئیشی خراپەیشی نەکردوە.

**سێهەم**: وازی لێ دەهێنێ چونکە ناتوانێ یان تەمەڵی دەکات دوای کۆششو نزیك بونەوە لێی ئەمە خراپەیەکی بۆ دەنوسرێت لە سەر نیەتە خراپەکەی. وەهەروەها پێغەمبەرمان دەفەرموێت: {إِن صَاحِبَ الشمال لَيرفَعَ القَلَمَ سِت سَاعَاتٍ عَنِ العَبدِ الْمُسْلِم الْمُخْطئ فَإن نَدِمَ وَاسْتَغْفَرَا ِمنهَا أَلقَاهَا وَإلا كُتَبتْ وَاحِدَةٌ/الط ا ، حسنه الألبا / فریشتەی لای چەپ بۆ ماوەی شەش ساعەت لەو عەبدە موسڵمانە کە گوناهی کردوە قەڵەمی نوسینی تاوانەکەی هەڵدەگرێت ، جا ئەگەر پەشیمان بویەوەو داوای لێخۆش بونی کرد لە اللە ، ئەوسا ئەویش فڕەی دەداتو ناینوسێت، ئەگەر وای نەکرد تەنها یەك تاوانی لە سەر دەنوسرێت}ئینجا دەفەرموێ:

(١٦١) ئەی محمدﷺ بڵێ: بێگومان پەروەردگارم ڕێنمای کردوم بۆ ڕێگای ڕاست کەئایینە ڕاستو بە نرخەکەیەتی ئەویش ئایینی ئیبراهیمە کە لایداوە لە هەمو شتێکی هەڵەو نارەواو ڕێرك وپێك وەستاوە لە سەر یەکخواناسیو ئەو لە هاوەڵ دانەران نەبووەومنیش هەر لە سەر ئەو ڕێبازەم.

(١٦٢) بڵێ: بێگومان بەراستی نوێژمو حەیوان سەربڕینمو ژیانمو مردنم بۆ اللە یە کە پەروەردگاری هەموو عالەمە.

(١٦٣) کە هیچ هاوبەشێکی نیەو تەنیایەو نیازی بە هاوەڵ نیەو هەر بەوەش ئەمرم پێ کراوە کە من خوا بپەرستمو من یەکەم موسڵمانم . ئاشکرایە بۆ ئەم ڕێبازە، پێغەمبەرمانﷺ یەکەم کەس بوە کە تەسلیمی ئەم ڕێبازە بووە لە پاشان لەووە بە خەڵکی تر گەیشتوە.

(١٦٤) ئەی محمدﷺ بڵێ: ئایا من بێجگە لە خوا کەسێکی تر بکەم بە پەروەردگاری خۆم لە گەڵ ئەوەشدا هەر ئەوە کە پەروەردگاری هەمووشتێکەو هیچ کەسێك هیچ خراپەیەك ناکات مەگەر لە سەر خۆی بنوسرێت ، چونکە هیچ نەفسێکی تاوانبار ناتوانێ تاوانی کەسێکی تر هەڵگرێت لە پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای پەروەردگاری خۆتانە ، ئەوسا لەوێ خەبەرتان پێ دەدات بەو شتەی کە ئێوە لە دنیادا ناکۆکیتان تێدا بوە کە دوا ڕۆژو ئەم ئایینەو پێغەمبەرەکەیەتیو هەندێکتان باوەڕتان پێ کردو هەندێکی ترتان باوەڕتان پێ نەکرد.

(١٦٥) خۆ ئەو ، ئەو کەسەیە کە ئێوەی کردوە بە جێنشین لە سەر زەویداو چین لە دوای چین دێنو زەوی ئاوەدان دەکەنەوەو هەندێکتانی چەند پلە بە سەر هەندێکی ترتاندا بەرز کردوەتەوە بە هۆی زانیاریو لە خوا ترسانو خزمەت بە خەڵكو سەروەتو سامانوهێزو دەسەڵاتی دنیاییەوە تا خوا تاقیتان بکاتەوە لەوەی کە پێی داونو دەربکەوێت بۆ خۆتان کە چۆن ڕەفتار دەکەن لەکاتی پێدانی ئەو نعمەتانەدا یان پێنەدانی ، بێگومان پەروەردگارت زۆر بە پەلەیە لە تۆڵە سەندنەوەداو  ئەو زۆر لێ بوردەیە لە تاوانی بەندەکانیو خاوەنی بەزەییو سۆزە بۆیان. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { لَوْ يَعْلَمُ الْمُؤْمِنُ مَا عِنْدَ ا ِمنْ الْعُقُوبَةِ مَا طَمِعَ ِفي الْجَنةِ أَحَدٌ وَلَوْ يَعْلَمُ الْكَافِرُ مَا عِنْدَ ا ِمنْ الرحْمَةِ مَا قَنطَ ِمنْ الْجَنةِ أَحَدٌ خَلَقَ ا ِمائَةَ رَحْمَةٍ فَوَضَعَ رَحْمَةً وَاحِدَةً بَيْنَ خَلْقِهِ يَتَرَاحَمُونَ بِهَا وَعِنْدَ ا ِتسْعَةٌ وَتِسْعُونَ رَحْمَةً / احمد،مسلم/ ئەگەر باوەڕدار بزانێت کە لای خوا چەندە تۆڵەی سەخت هەیە بە تەمای بەهەشت نابێ ، وە ئەگەر خوانەناسیش بزانێت کە لای خوا چەندە ڕەحمەتوسۆز هەیە لە بەهەشت نائۆمێد نابێ ،خوا سەد دانە ڕەحمەتی دروستکردوە یەك دانەی لە ناو هەمو دروستکراوەکانی خۆیدا داناوە کە بەزەییان بە یەکترا دێتەوەو لە لای خوا نەوەدو نۆ بەشی هەیە}

سا خوا لەوسۆزەی بێبەشمان نەکات. اللهم امين

## ٧ سورەتی ئەعراف ٢٠٦

سورەتی ئەعراف کە سورەتی حەوتەمی قورئانەو دوسەدو شەش ئایەتە لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە بێجگە لەئایەتی سەدوشەستو سێ تا سەدو حەفتا کە دەڵێن لە مەدینەدا هاتوتە خوارەوە.

ئەم سورەتە بەم ناوانەیش دەناسرێت: **المیقات، المیثاق**...

دایکی باوەڕداران عایشە دەڵێت: {**إن رَسُولَ اللهِ ﷺ قَرَأ فِي صَلَاةِ المَغْرِبِ بِسُورَةِ الْأَعْرَافِ فَرقها فِي رَكْعَتَيْن**/ النسائي، صححه الألبا / پێغەمبەری خوا لە لە دو رکاتی نوێژی مەغریبدا سورەتی ئەعرافی خوێندوە.}

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف، لام، میم، صاد. هەروەك لە پێشەوە باسمانکرد باشترین قسە ئەوەیە کە ئینسان خۆی بپارێزێت لە تەفسیر کردنی ئەم پیتانە، بەڵام باوەڕی وابێ کەبێ سودنین.

(٢) ئەمە پەڕاوێکە رەوانەکراوەتە لای تۆو گاڵتەو گەمە نیەو خۆت دات نەناوە جا با دڵت تەنگ نەبێ لەبارەی قسەی پڕو پوچی بێ باوەڕانەوە سەبارەت بەو کتێبە کە وەحیمان کردوەتە لات، تۆ بە خەڵکی رابگەیەنە جاخەڵك بەگوێت ناکات دڵت تەنگ نەبێ ، بۆیە رەوانەمانکردوە تاتۆ خەڵکی لاسارو سەرکەشی پێ بترسێنی، وە تا ئەم پەڕاوە دەرسو ئامۆژگاری بێ بۆ باوەڕداران واتە ئەوەی باوەڕدارە سودی لێ وەردەگرێت ئەوەش کە باوەڕدارنیە تاوانی بێ باوەڕیەکەی لەسەر تۆنیە. ئینجا دەفەرموێ:

(٣) دەی پەیڕەوی بکەن لەوەی کە رەوانەکراوەتەلاتان لەلایەن پەروەردگارتانەوەو شوێن پێی پێغەمبەرەکەتان بگرنو پەیڕەوی بێجگەلە ئەوزاتە نەکەنو نەیکەن بەدۆست بۆخۆتان، کەم بیر دەکەنەوە، دەبوایە هەمیشە ژیری خۆتانتان بخستایە کارەوەو رێگای هەڵەتان نەگرتایە،

(٤) خۆ زۆر خەڵکی دێهاتوشارمان لەناو برد ، جا سزای ئێمەیان بۆ هات لە شەوو لەکاتی خەوتندا یان لە رۆژو لەکاتی پشودانی پێش نیوەڕۆیاندا

(٥) جا کاتێك کە سزای ئێمە یان بۆ دەهات هاوارو بانگی ئەوان هیچ نەبو جگە لەوەی کە دەیان وت: بێگومان کەئێمە ستەمکاربوین. واتە ئەوکاتە بیریان دەکردەوە بەڵام چ سودی هەبو کاتێك کەسزای خوا دەهات ، جا ﷲ ئەوە باس دەکات بۆ ئێمە تا بەڵکو وەك ئەوان توش نەبینو ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

## ٧ سُورَةُ الأَعۡرَافِ ٢٠٦

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓصٓ (١) كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ (٢) ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ (٣) وَكَم مِّن قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَا فَجَآءَهَا بَأۡسُنَا بَيَٰتًا أَوۡ هُمۡ قَآئِلُونَ (٤) فَمَا كَانَ دَعۡوَىٰهُمۡ إِذۡ جَآءَهُم بَأۡسُنَآ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ (٥) فَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلَّذِينَ أُرۡسِلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَنَسۡـَٔلَنَّ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٦) فَلَنَقُصَّنَّ عَلَيۡهِم بِعِلۡمٖۖ وَمَا كُنَّا غَآئِبِينَ (٧) وَٱلۡوَزۡنُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّۚ فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ (٨) وَمَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُم بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَظۡلِمُونَ (٩) وَلَقَدۡ مَكَّنَّٰكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَۗ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ (١٠) وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ (١١)

(٦) سوێند بەخۆم پرسیار دەکەین لەو گەلانەی کە پێغەمبەرمان بۆ رەوانەکردون کە چۆن وەڵامی پێغەمبەرە کەیان داوەتەوە وە چیان لە گەڵدا کردونو پرسیاریش لەو پێغەمبەرانەش دەکەین کە ئێوە چۆنتان پێ راگەیاندونو گەلەکەتان چۆنی وەڵام داونەتەوە؟

(٧) ئەوکاتە ئێمە باسی دەکەین بۆئەوان لە روی ئەوزانیارییە وردوەکەهەمانە نەك لە خۆمانەوە قسەبکەین بێجگەلەوەی کە فریشتەکان نوسیویانەو زەوی تۆماری کردوەو نوسخەی وەك کردارەکانیان لێ گیراوە ﷲ دەفەرموێ: خۆ ئێمە بێ ئاگاونادیار نەبوین لەوانوهەموشتیان لەبەرچاومان بوە. ئینجا دەفەرموێ:

(٨) ئەو رۆژە کێشانە زۆر وردورێك و پێکەو هیچ کەس ستەمی لێ ناکرێتو هیچ کەس زیادەیەکی لە سەر دانانرێت جا ئەو کەسەی کە تای ترازوی چاکەکانی قورس بێت ئەوسابەراستی ئەوانە سەرفەرازو خۆش بەختنو بەرەو بەهەشتی هەمیشەیی رەوانە دەکرێن

(٩) خۆ ئەوکەسەی کەتای تەرازوی چاکەکانی سووك بێتو خراپەی قورس بێ ئەوسابەراستی ئەوانە کەسانێکن کە خۆیانیان دۆڕاندوەو زیانیان لەنەفسی خۆیان داوە بەهۆی ئەوەی کە دژایەتی نیشانەکانی ئێمەیان کردوە ، ئینجا کێشانە چۆن دەکرێت؟ ئایا ئەوەی کە نوسراوە لەناو دەفتەرەکانیان یان کابرا

قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسْجُدَ إِذْ أَمَرْتُكَ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿١٢﴾ قَالَ فَٱهْبِطْ مِنْهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخْرُجْ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿١٣﴾ قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤﴾ قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿١٥﴾ قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ لَءَاتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ ﴿١٧﴾ قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًا لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿١٨﴾ وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ فَوَسْوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيْطَٰنُ لِيُبْدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنْهُمَا مِن سَوْءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنْ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيْنِ أَوْ تَكُونَا مِنَ ٱلْخَٰلِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ﴿٢١﴾ فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٍ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمْ أَنْهَكُمَا عَن تِلْكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمَا عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٢٢﴾

بەئەندازەی کردارەکانی گەورە دەکریێتو دەکێشرێت یان کردوەکانیان دەکرێت بەشێوەی زەلامێك یان سێ جار کێشانە دەکرێت هەرجارەی بەشێوەیەك لەو شێوانەی کەباسکران هەموی دەگونجێ ، گرنگ ئەوەیە کە کردارو وتارو نیەتی هیچ کەسێك لای خوا ون نابێو ستەم لە هیچ کەسێکیش ناکرێت .
پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەربارەی عەبدولاَ کوڕی مەسعود کە مرۆڤێکی زۆر بچوكو دوو لاقی زۆر باریکی پێوەبوون فەرموی: { وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُمَا أَثْقَلُ فِي المِيزَانِ مِنْ أُحُدٍ / ا د. صحه الألبا / ئایا ئێوە سەرتان سوڕدەمێنێ لەباریکی هەردوو قاچی سوێند بەو کەسەی کەگیانی منی بەدەستە ئەودوو قاچەی لەکێشانەدا قورسترن لە چیایی ئوحود}

﴿١٠﴾ بەراستی ئێوەمان جێگیر کردوە لەم زەوییەداو پێبژێویمان لەناویدا بۆ داناون بەلاَم ئێوە کەم سوپاسی ﷲ دەکەن . جا وا ﷲ داستانی دروستبونی باوکە گەورەمان ئادەم بەشێوەیەکی زۆرکورتو کێشەی شەیتانو سەرئەنجامی کێشەکەیو پاڕانەوەی خۆی وهاوسەرەکەیمانو ئاکامی ئەو رووداوەمان بۆ باس دەکات و دەفەرموێ:

﴿١١﴾ خۆ بەحەقیقەت ئێمە ئێوەمان دروستکردوە پاشان بەو شێوەیە کەخۆمان ویستمان وێنەمان کێشان؟، ئینجا بە فریشتەکانمان وت: سوجدە ببەن بۆ ئادەم ئەوسا هەموویان بێ درەنگ سوجدەیان برد بێجگە لە شەیتان کە ئەو سوجدەی نەبردو نەهاتە ریزی سوجدەبەرانەوە

﴿١٢﴾ خوا فەرموی: ئەی شەیتان چ شتێك وای لە تۆ کرد کە سوجدە نەبەیت ئەوکاتەی کەمن دەستورم پێ دایت کە سوجدە ببەیت شەیتان وتی: بۆیە سوجدەی بۆنابەم چونکە من لەو چاکترم ، بەڵگەی خۆبەچاك زانی باس دەکاتو دەڵێ منت لە ئاگر دروستکردووەو ئەوت دروستکردووە لە قوڕ ئاگرم لەلا بەرێزترە ، شەیتان لێرەدا هەر تەماشای رواڵەتی کردوەو بیری لەوەنەکردوە کە ئادەم خوا بەدەستی خۆی دروستی کردوەو گیانی وەبەرا کردوە ، وەبیری لەوە نەکردوە کە خاك سەرچاوەی ژیانی هەمو گیان لەبەرانیەتی لەسەر زەویداو کەرەسەکانی ئاگریش هەمو لەناو خاکدانو بەشێکن لەوخاکەو ئەوەندە بەسودە ئەوەندەش وێران کەرو لەناوبەرە خۆهەرچەندە بەرێزیشبێ هەربەشێکی خاکە ، دەستێکی مرۆڤ هەرچەند بەهێزبێ ئەومرۆڤە بەهەمو بەشەکانیەو بەرێزترە لەویەك دەستە، جا ئەمە قیاسێك بو کە شەیتان کردی قیاسێکی هەڵەو بەو قیاسە هەڵەیە خۆیو پەیڕەوانی بۆ هەمیشە سەرشۆڕو رسواکرد، دەڵێن ئەوەڵ کەسێکیش کە قیاسی کردوە شەیتان بوە ، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {خُلِقَتِ المَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ وَخُلِقَ الجَانُ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ وَخُلِقَ آدَمُ مِما وُصِفَ لَكُمْ /مسلم/ فریشتەکان لە روناکی دروستکراونو شەیتان لە پوختەی ئاگر دروستکراوە ، وە ئادەمیش لە وە دروستکراوە کە بۆتان باس کراوە} واتە لە خاك .
دیارە دروستبونی ئادەم لە خاك بەم قۆناغانەدا تێ پەڕیوە، **یەکەم**: خاك بووە. **دوهەم**: کراوبە قوڕ. **سێهەم**: قوڕێکی لینجو مچ. **چوارەم**: قوڕێکی ترشاو . **پێنجەم**: قوڕێکی وشکبوی وەك کەندو . **شەشهەم**: ئەو شێوە کەندوە ئەوەندە وشکبوە کەدەستی لێ بدرایە زیکەی لێوەدەهات، بەڵێ، خوای میهرەبانو بەدەسەلاَت دەیتوانی هەروەك باقی دروستکراوەکانی تر بەئەمیش بفەرموێت: ببە، دەبو. بەلاَم خوای دانا دروستکراوێك دروستدەکات کەپێویستە ئیشەکانی لەسەر خۆو قۆناغ بەقۆناغ ورێكو پێك بێو ناتوانێ هەمو پێویستیەکانیو ئەرکەکانی بێ پشودانو لەیەك قۆناغدا ئەنجام بدات لەبەرئەوە ئەو دەرسەی بەشێوەی کردەوەیو لەبەرچاو بەنەوەکانی دەڵێ تائەوانیش فێری هەڵسو کەوتو خۆگریو دانانی بەرنامەی رێکو پێك بۆ ژیانیان ببن، جا سەرەتا دوژمنمان پێ دەناسێو بەو دوژمنە دەفەرموێ:

﴿١٣﴾ دابەزە لەو بەهەشتەی کە تێیدایت چونکە بۆتۆ نیە لەو شوێنەدا خۆت بەگەورە بزانی دەی دەرچوە بەراستی تۆ لەریزی

بێ نرخ و سوک و سەرشۆڕاندایت، جا کە زانی تازە دەستی لەو نازو نیعمەتە بڕاوەو لەو بارەوە هیچی بۆ ناکرێت،

(١٤) وتی دەی مۆڵەتم بدە تاکو ئەو ڕۆژەی کە خەڵکی زیندو دەکرێنەوە. بەم شێوە شەیتان دەیویست کە خۆی دەربازکات لە مردن .

(١٥) خوایش فەرمووی: تۆ لە مۆڵەت دراوانی بەڵام نەک تاکاتی زیندو بوونەوە بەڵکو تاکاتی نەمانی ژیانی بەرەی ئادەمیو تویش دەبێ بمریتو زیندو بکرێیتەوە بۆ حیساب وەک لە سورەتی (صاد)ئایەتی ٨٠-٨١ دا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ (٨٠) إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ (٨١) ﴾ ص: ٨٠ – ٨١

خوا دەفەرموێ: بەراستی تۆ لەوانەئەبی کە ماوە دەدرێن هەتا ڕۆژی کاتی دیاریی) بەم شێوەیە دەرکەوت کە ماوەدان بە شەیتان بڕیاری کۆنی خوایەو ئەو بڕیارەش هەڵناوەشێتەوە تائەو کاتە دەبێ ئەو نەفرین لێ کراوە بمێنێو بەخراپەکاری خۆی درێژە بدات، ئەگەر بیر بکەینەوە لە داخوازیو قسەکانی شەیتان دەبینین کە شەیتان بێ باوەڕ نەبوە ـ ئەگەر باوەڕ هەرزانینو قسەبێ ـ ئیتر بۆ کافرە؟ بەڵام بەراستی داستانی شەیتان مانای باوەڕمان بەچاکی بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە باوەڕ بریتیە لە ناودڵو وتەی زمانو کردەوە ئەگەر کردەوە نەبو زانینە نەک باوەڕ واتە: مەسەلەی عیلمو ئیمان دوو شتی لەیەك جیان شەیتان ئەو بناغانەی ئاینی هەمو زانیوە بەڵام ئامادە نەبوە بەو زانینە ئیش بکاتو گەرموگوڕ بوونی لەسەر فەساد هەڵی دەنێو لە باتی پەشیمان بوونەوە،

(١٦) دەڵێ جا بەهۆی ئەوەی کەمنت گومڕاکرد سوێندبێ منیش دادەنیشمو کەمین دەکەم بۆ ئەوان لەسەر ڕێگا ڕاستەکەتدا .

(١٧) لەپاشان بۆیان دەچم لەبەردەمیانەوەو لە پشتیانەوە، وە لەلای ڕاستیانەوەو لە چەپیانەوە واتە بەهەمو شێوەیەك دێمە ڕێگایانوتۆ زۆربەی ئەوانت دەست ناکەوێت کە سوپاست بکەن ، وەبەداخەوە ئەم پێشبینیەیی شەیتان ڕاست دەرچو لە سورەتی (السبأ) ئایەتی بیستدا دەفەرموێ: ( بەراستی شەیتان گومانەکەی خۆی بردەسەر دژی ئەوان ، جادوای کەوتن بێجگە لە کۆمەڵێك لە باوەڕداران)

عەبدوڵای کوڕی عومەر(خواڵێیان ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پاڕانەوانەی نە بەیانیاو نە ئێواران وازلێ نەهێناوە{ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ العَافِيَةَ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ العَفْوَ وَالعَافِيَةَ فِي دِينِي وَدُنْيَايَ وَأَهْلِي وَمَالِي اللَّهُمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي وَآمِنْ رَوْعَاتِي اللَّهُمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَمِنْ فَوْقِي وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي / ا د وا اكم وقال صحيح الاسناد/ئەی خوایە داوای چاوپۆشیو تەندروستی دونیاو قیامەتت لێ دەکەم، ئەی خوایە داوای چاوپووشیو تەندروستی ئایینو ژیانو ئەهلو ماڵت لێ دەکەم، ئەی خوایە عەیبەکانم داپۆشە ئەی خوایە ترسەکانم بگۆڕە بە هێوری، ئەی خوایە بم پارێزی لە بەردەممو لە پشتمو لە ڕاستمو لە چەپمو لە سەرم، وەپەنا بەگەورەیت دەگرم کەلە ژێر قاچمەوە بکوژرێم).

(١٨) خوا فەرمووی: دەرچۆ لەوێدا ئابڕوچوانەو تێ هەڵدراوانە سوێند بەخۆم ئەو کەسەی لەوان کە پەیڕەوی تۆ بن چاوپۆشیان لێ ناکەم جەهەنم پڕ دەکەم لە ئێوە هەموتانو هیچکامتان لە دەستم دەرناچنو لە بیر نابرێنەوەو لێم پەنانادرێن چونکە ئێمە ڕێگای خۆمانمان ڕۆشنکردوەتەوەو کەس بەهانەی نەماوە بۆ قیامەت، ئیجا خوای میهرەبان ڕوودەکاتە ئادەمو دەفەرموێ:

(١٩) ئەی ئادەم خۆتو هاوسەرەکەت ئارام بگرن لەم بەهەشتەداو دانیشن، جا بخۆن لەهەر جێگایەکو لە هەر شتێك کە ئارە زۆتان لێی بێ بەڵام نزیکی ئەم درختە نەکەونەوە ، ﷲ درختێکی بۆ دیاری کردن چونکە ئەگەر نزیکی ئەو درختە ببنەوە هەردووکتان لە ستەمکاران دەبن.  بەڵام زۆری نەخایاند

(٢٠) ئەوسا ئەو شەیتانەی کە بەڵێنی داوە بۆ فریودانی ئادەمو نەوەکانی خەتەرەی دروستکرد لەناو دڵی ئادەمو حەوادا بۆئەوەی عەیبو عاری داپۆشراوی ئەوان دەر بخاتو ڕوتیان بکاتەوە، وتی: خوای ئێوە بۆیە بەرگری کردوە هیچ مەبەستێکی نیە مەگەر بۆ ئەوەی کە ئێوە وەکو فریشتەکان نەبن، وە ئێوە لەوانە نەبن کە بۆ هەمیشە لەوێدا بمێننەوە، ئەگەر بێتو بیخۆن هەم وەك فریشتەکان دەبنو هەم بۆ هەمیشەش دەمێننەوە .

(٢١) وەلەسەر ڕاستی ئەم قسەیەی خۆی سوێندی بۆ خواردن بەخوا کە من یەکێکم لە ئامۆژگاری کەران بۆ ئێوەو مەبەستم خۆشیو خۆشبەختی ئێوەیە.

(٢٢) جا ئابەم جۆرە هەردووکیانی ڕێنمایی کرد بۆ لە خۆ بایی بونو سەری لێ تێك دان ، ئینجا ئەوانیش لەبەروبومی ئەودرەختەیان خوارد، جاکاتێ کە لەو درختەیان خوارد پۆشاکیان لەبەردانەماو عەیبیان دەرکەوتو بەپەلە گەڵای ئەوباخەیان دەهێناو خۆیان پێ دادەپۆشیو پەروەردگاریان بانگی کردن: ئەی من ئێوەم قەدەغە نەکرد لە خواردنی ئەو درختەو پێم نەوتن، کە شەیتان دوژمنی ئاشکراتانەو ئاگاتان لە خۆتان بێت؟ جا دەگونجێ هەروەك مانامان کرد وابێ کە ڕواڵەتی ئایەتەکە کەهەر

قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ ٱهْبِطُوا۟ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ وَلَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مُسْتَقَرٌّ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٢٤﴾ قَالَ فِيهَا تَحْيَوْنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنْهَا تُخْرَجُونَ ﴿٢٥﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ قَدْ أَنزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَٰرِى سَوْءَٰتِكُمْ وَرِيشًا ۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقْوَىٰ ذَٰلِكَ خَيْرٌ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰبَنِىٓ ءَادَمَ لَا يَفْتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ كَمَآ أَخْرَجَ أَبَوَيْكُم مِّنَ ٱلْجَنَّةِ يَنزِعُ عَنْهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوْءَٰتِهِمَآ ۗ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمْ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنْ حَيْثُ لَا تَرَوْنَهُمْ ۗ إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً قَالُوا۟ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَا ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ ۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ قُلْ أَمَرَ رَبِّى بِٱلْقِسْطِ ۖ وَأَقِيمُوا۟ وُجُوهَكُمْ عِندَ كُلِّ مَسْجِدٍ وَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۚ كَمَا بَدَأَكُمْ تَعُودُونَ ﴿٢٩﴾ فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُ ۗ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ ﴿٣٠﴾

زۆر بەزوویی ئەوەی لێ وەردەگیرێ یان مەبەست ئەوەبێ کەئادەمو حەوا تالەو درختەیان نەخواردبو هێزی شەهوانیان نەبو هەستی تەماشا کردنی یەکتریان نەدەکرد کەلە درختەکەیان خوارد هەستیان جوڵاو ناچار بۆ داپۆشینی عەیبی خۆیان پەنایان بردە بەر گەڵای درختان ، واللە اعلم. ئینجا ئادەمو حەوا هەستیان بەتاوانی خۆیان کردو پەشیمان بونەوە،

﴿٢٣﴾ هەردووکیان وتیان: ئەی پەروەدگارمان بەراستی ئێمە ستەممان کردوە لەخۆمانو ئەگەر تۆ لە گوناهمان خۆش نەبیتو رەحممان پێ نەکەیت سوێند بەزاتت ئەوکاتە ئێمە لە کۆمەڵی رەنجەڕۆیان دەبین، جا خوا تۆبەی لە ئادەمو حەوا وەرگرت چونکە پەشیمان بونەوە.

﴿٢٤﴾ فەرموی: دابەزنە خوارەوە هەندێکتان دوژمنی هەندێکتان دەبن ، وەبۆ ئێوە لەم زەویدا شوێنی ئارام گرتنو خۆشی هەیە تاماوەیەك. بەڵێ ئابەم شێوەیە ئادەم لەو نازونیعمەتە دەرهێنراو بەرەو مەبەستی سەرەکی دروستبوونی کە جێ نشینیە لەم زەویەدا بەڕێ کرا _لەم بارەوە لە سورەتی بەقەرەدا قسەمان کردوەو پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکات.

﴿٢٥﴾ فەرموی: ئێوەلەناو ئەم زەویەدا دەژینو لەوێدا دەمرنو دووبارە لەوێوە دەر دەهێنرێنەوەو زیندو دەکرێنەوە بۆ حیسابو پاداشتو سزا ، وەلە سورەتی (طه)ئایەتی ٥٥دا بەهەمان شێوە دەفەرموێ: (لەم زەویە ئێوەمان دروستکردوەو دەتان کەینەوە بەخاكو جارێکی تر لەوێوە دەرتان دەهێنینەوە) بەڵێ، بەراستی شەڕی شەیتانو نەوەکانی لە خۆیو لە ئادەمی لەگەڵ پاکانی نەوەی ئادەم شەڕێکی سەختو درێژ خایەنەو دەبێ رۆژێ بێتە پێشەوە کە شەیتانو پەیڕەوانی سزای تەواوی سەرپێچیو تاوانکاری خۆیان وەرگرنو چاکەکارانیش بە پاداشتی خۆیان بگەن، ئینجا خوای داناو میهرەبان ئامۆژگاری نەوەی ئادەم دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٢٦﴾ ئەی بنیام بەراستی ئێمە رەوانەمان کرد بۆتان لیباسو پۆشاك، بۆپاراستنتان لەگەرماو سەرماو هەم بۆجوانیش مەبەست لەناردن ئەوەیە کە ﷲ، هۆی پەیدابوونی ئەو پۆشاکەی لەئاسمانەوە ناردوە کەبارانەو لە ئاسمانەوە باران دەبارێتو دەبێ بەهۆی سەوز بوونی گیاو ژیانی مەڕومالاَّت کە لیباس بەزۆری لەو رۆکانەو لەخوری وموووکورك و پێستی حەیواناتەوەیە، ئەگەر بارانو ئاو نەبێ هیچیان نابن کەواتە وشەی ﴿ أَنزَلْنَا ﴾ الأعراف: ٢٦ / رەوانەمان کرد) جێگای خۆیەتی، جا ﷲ، مەڕومالاَّتو لۆکەو هەورێشمی کرد بەسەرچاوەیەکی سەرەکی پۆشاك تا عەیبەکانی خۆتانی پێ داپۆشنو بۆ جوانیش تا بتوانن خۆتانی پێ بڕازێننەوەو لەسەر ئەمانەیشەوە پۆشاکێکی تر هەیە کەپۆشاکی لە خوا ترسانو خۆپاراستنە لەو شتانەی کەدەبنە هۆی رقو قینی ﷲ، کەئەوەیان چاکترەو بەسود ترەو مایەی خۆشبەختی هەردوو دنیایە چونکە ئەگەر مرۆڤ لە خوا ترسا نەپیاو لیباسی هەورێشم دەپۆشێتو نەپۆشاکی تەنگو تروسكو درێژ دروست دەکات ونە ئافرەتان خۆیان روت دەکەنەوەو خۆیان بەو هەرزانیە دەفرۆشن بە چاوچنۆکان کەواتە، پۆشاکی تەقوا گەورەترینو بنەڕەت ترین پۆشاکەو ئەگەر ئەو پۆشاکە ناو دەرونیە نەبێ پۆشاکە رواڵەتیەکان هەر زۆر زوو پارچە پارچە دەبنو نامێنن ، بەداخەوە مرۆڤی ئەمڕۆ لەباتی بە مرۆڤ بون لەروتیو تێکەڵاویدا شانازی بەئاژەڵ بونەوە دەکات؟! ئینجا دەفەرموێ: ئەوەی کە باسمان کرد هەندێکن لە نیشانەکانی ﷲ، بەڵکو ئێوەش بیر بکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرنو وازبێنن لەتاوانو خراپەکاری وپۆشینی پۆشاکی نادروستو خۆچواندن بەئاژەڵەوە . ئینجا دەفەرموێ

﴿٢٧﴾ ئەی بنیام شەیتان نەتان خەڵەتێنێ هەروەك چۆن دایكو باوکتانی لە بەهەشتدا دا بەدەرکردن، کەپۆشاکەکەیانی لەبەر داکەندن تا عەیبیان دەرکەوێتو سوك ببن واتە دەرکەوتنی عەیبە ، هۆی سوك بونی مرۆڤە چ پیاو چ ئافرەت جا ئەوە کەی ژیریە کە بنیام بەدەستی خۆی خۆی سوك بکات؟ بێگومان کە

ئەوشەیتانە خۆیو تاقمەکەیشی ئێوە دەبینێ بە شێوەیەك کە ئێوە ئەوان نابینن واتە بە شێوەی خۆیان ئێمە شەیتانو تیرەکەی نابینین، بێگومان کە ئێمە شەیتانمان کردوە بە دۆستی ئەوکەسانەی کە باوەڕ ناهێنن واتە ئەگەر کەسێك باوەڕداربێت شەیتان ناکرێ بەسەرپەرشتیو ناتوانێ بەرەو شەرمەزاریو نزمی بیبات ، ئابەم شێوەیە پەروەردگارمان دەمان ترسێنێ لە شەیتانو پێڕەکەی وەك لە سورەتی (الکهف)ئایەتی ٥٠دا دەفەرموێ:(ئایا شەیتانو نەوەکەی دەکەن بەدۆستی خۆتانو وازلەمن دەهێنن لەحاڵێداکەئەو دوژمنتانە؟ پیسترین ئاڵوگۆڕکردنێکە ئائەمە بۆ ستەمکاران). ئینجا دەفەرموێ:

(٢٨) ئەو بێ باوەڕانە هەرکاتێ خراپەیان دەکرد دەیان وت: بابو باپیرانمان ئاوایان کردوە دیارە ئەوانیش لە خۆیانەوە نەبووە بەڵکو بەبڕیاری اللّٰهبووەو اللّٰه یش وای دەستور پێ داوین کە ئاوابکەین.

دەڵێن عەرەب بێجگە لە قورەیش بەو لیباسەی کە پۆشیبویان تەوافی کەعبەیان نەدەکرد گوایە چونکە بەو لیباسە تاوانیان کردوە جا ئەگەر لیباسی تازەیان نەبوایە یان قورەیش لیباسی پێ نەدانایە بەڕوتی تەوافیان دەکرد تەنانەت ئافرەت بەڕوتی بێجگەلە پەڕۆیەك کەلە سەر عەیبی خۆی دای دەنا تەوافی دەکردو ئەمەیان بەفەرمانی اللّٰه دادەنا بۆیە اللّٰه بەتوندی سەرکۆنەیان دەکاتو دەفەرموێ: ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: اللّٰه هەرگیز دەستورنادات بە خراپەکاریو داوێن پیسی ئایا ئێوە شتانێك دەڵێن لەبارەی خواوە کە خۆتان هیچ زانیارییەکتان لە سەری نیە؟! واتە نەزانانەو بێ ئاگایانە بڕیار دەدەن. ئینجا دەفەرموێ:

(٢٩) پێیان بڵێ: پەروەردگارم دەستوری داوە بەهاوتایو دادپەروەری ، وە فەرمانی داوە کە لە هەمو مزگەوتەکاندا رووتان راست بکەنە اللّٰهو لە کاتی هەمو بەندایەتیو پاڕانەوەکانتان دا خۆتان یەك لا بکەنەوە بۆیو هەرلەو بپاڕێنەوە، وەئەو بپەرستن بەشێوەیەك کە هاوتابێتەوە لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا جا هەروەك چۆن ئێوەی لەسەرەتاوە دروستکردوە هەرئاوەها دروستتان دەکاتەوە بۆ حیساب، جاکە دروستی کردوون،

(٣٠) ئەوکاتە کۆمەڵێك ڕێنماییو هیدایەت دەداتو وەکۆمەڵێکیش بەهۆی خراپی خۆیانەوە دوچاری گومڕاهیو سەرلێ شێواوی دەکات چونکە ئەوان لەباتی اللّٰه دا شەیتانیان کردوە بە دۆستی خۆیانو وا دەزانن کە ئەوان هیدایەت دراونو ڕێگەی هیدایەتیان گرتوە ! واتە ئەمانە بێ باوەڕو کافربوون بەلام خۆیان وادەزانن کەلەسەر ڕێگای راستنو ئیشی خۆیانیان

يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ (٣١) قُلۡ مَنۡ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَٰتِ مِنَ ٱلرِّزۡقِۚ قُلۡ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا خَالِصَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ (٣٢) قُلۡ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلۡفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنۡهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلۡإِثۡمَ وَٱلۡبَغۡيَ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَأَن تُشۡرِكُواْ بِٱللَّهِ مَا لَمۡ يُنَزِّلۡ بِهِۦ سُلۡطَٰنٗا وَأَن تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ (٣٣) وَلِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٞۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ (٣٤) يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ إِمَّا يَأۡتِيَنَّكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَقُصُّونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِي فَمَنِ ٱتَّقَىٰ وَأَصۡلَحَ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ (٣٥) وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٣٦) فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ يَنَالُهُمۡ نَصِيبُهُم مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا يَتَوَفَّوۡنَهُمۡ قَالُوٓاْ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالُواْ ضَلُّواْ عَنَّا وَشَهِدُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰفِرِينَ (٣٧)

بەلاوە چاکە کەبەم جۆرە کەسانە دەوترێ نەزانینی ئاوێتەی هەیە (الجهل المركب) جارێکی تر خوا بانگ دەکاتە خەڵكو دەفەرموێ:

(٣١) ئەی کوڕانی ئادەم لەکاتی نوێژەکانتانداولە کاتی هاتوچۆی مزگەوتەکانتاندا جلو بەرگی جوان بپۆشن. سوننەت وایە لەکاتی نوێژو لەکاتی چونە مزگەوتدا مرۆڤ جلو بەرگی جوانو خاوێن بپۆشێ چونکە بەرامبەری خالقی خۆی رادەوەستێ تا جوانو پاكو خاوێنتربێ چاکترە ، وەبخۆنو بخۆنەوەو زیادەڕەوی مەکەن بەبێگومان کە ئەوزاتە مرۆڤی زیادەڕەوی خۆش ناوێ. جا تەماشاکەن چۆن اللّٰه، ڕێگەی ژیانمان پێشان دەدات ئایا ئەگەر ئێمە زیادەڕەوی بکەین هیچ زیانێك لە اللّٰه دەکەوێت؟ خۆئەگەر زیادەڕەویمان کرد هەم ماڵی خۆمان لەبەین دەبەینو هەم لە ئایندەشدا دەبین بەسەربار بەسەر کۆمەڵگاوە، هەندێ لە پێشینە ساڵحەکان وتویانە: خوا تەواوی نەخۆشیو چارەسەریەکانی لەنێو ئەم ئایەتەدا باسکردوە( بخۆنو بخۆنەوەو زیادەڕەوی مەکەن ).

(٣٢) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: کێ ئەو پۆشاكوخشڵە جوانەو ئەو شتەپاكو خاوێنانەی کە اللّٰه پێی رەوابینیون حەرام کردوە؟ واتە کەس بۆی نیە کە حەرامیان بکات، بڵێ: ئەو زینەتو رزقورۆزیە پاکانە بۆ ئیماندارانە لە ژیانی دونیاداو هەر تایبەتی خۆیشیانە لە رۆژی دوایی داو قەدەغەکراوە لە بێ باوەڕان چونکە ئەوان دۆزەخینو دۆزەخیش هیچ نیعمەتێکی تێدانیە ، جا کێ

هەردوو ژیانی دەوێ باپەیڕەوی ئایین بێو دڵگرم بێ لەسەریو خەڵکیشی بۆ بانگ بكات تا بەرهەمو سودی ئەو دنیایشی زیاتر ببێت، ئینجا ﷲ، دەفەرموێ: ئێمە هەر ئاوەها درێژە دەدەین بە نیشانەكانی خۆمان بۆ گەلێك كە شت دەزانن واتە گەلی نەزان سود لەم ئایەتانە وەرناگرێت، هەرچەندە تۆ باسی ئاینی خوایی بۆ بكەیت ئەو خەریكی حیسابێكی ترەو دڵی بۆ شوێنێكی تر لێ دەدات، ئینجا ﷲ، باسی چوار خراپەو تاوان دەكاتو دەفەرموێ:

(٣٣) پێیان بڵێ: خوای من تەنها داوێن پیسی حەرام كردوە چ ئەوەی كە ئاشكرابێتو چ ئەوەی كەبە پەنامەكی بێتو گوناحودەستدرێژی ناحەقو هاوەڵ دابنێن بۆ خوا كە هیچ بەڵگەیەكی لەسەربونی ئەو هاوبەشییە رەوانە نەكردوە بۆتان، واتە قسەیەكی پوچی بێ ناوەرۆكەو مایەیی شەرمەندەییو دۆزەخی هەتاهەتایی مرۆڤە، جا بۆتاوانی چوارەمیان دەفەرموێ: كە لە خۆتانەوە قسەیەك هەڵبەستن بەدەمی خواوەو شتێك بڵێن كە خۆتان هیچی لێ نازانن. جا وەك لە پێشەوە باسمان كرد ئەم بێ باوەڕانە هەروا لە خۆیانەوە دەیان وت فلان شت حەلاڵەو فلان شت حەرامەو بەكەیفی خۆیان حەلاڵو حەرامیان دادەنا بەداخەوە ئێستاش زۆر قسەی ئاوا هەڵەو نارەوا دەكرێتو كابرا دەڵێت باشە بۆ ئەوەی خوا سەری بریوە ناخورێت بەڵام ئەوەی من سەری ببڕم دەخورێت؟ رخنە لە یاسای ئیسلام دەگرنو یاسا دادەنێنو حەرام حەلاڵ دەكەنو حەلاڵیش حەرام دەكەن كە ئەركی سەر شانی خاوەن باوەڕان ئەوەیە كە بەگوێرەی توانا فەرمان بەچاكەو بەرگری لە خراپەبكەنو بزانن كە تاوانباران رزگارنابن وەك دەفەرموێ:

(٣٤) بۆهەرگەلێك ماوەیەكی دیاری كراو هەیە بۆ فەوتاندن یان بەرزوبونەوەیان جا هەركاتێك ماوەی دیاری كراویان هات نەدەتوانن ماوەیەك دوای بخەنونەپێشی بخەن واتە ئەگەر كاتی مەرگی گەلێ یان كەسێك هات یەك چاوبرِكەیەك پێشو پاش ناكرێت، جارێكی تر پەروەدگاری عالەم بانگ دەكاتەوە خەڵكو دەفەرموێ:

(٣٥) ئەی كوڕانی ئادەم ئەگەر پێغەمبەرانێ لەخۆتان هاتنە لاتانو نیشانەكانی ئێمەیان بۆ باسكردن جائەوكەسەی كە لە خوا ترساوئیشی باشی كرد ئیتر هیچ ترسیان نیە ئەوانو دڵتەنگ نابن ئەو رۆژەی كەهەمو ئینسانەكان لە نارەحەتیدا بە چۆكا دەكەون، وەئەوان لە سزای ئەو رۆژە سەربەرزانە رزگاردەبنو خەفەتو دڵتەنگیان نابێت، ئینجا قورئان هەروەك نەریتی خۆی

كەباسی چاكەكارو پاداشتی كردن باسی خراپەكارو پاداشتی ئەوانیش دەكاتو دەفەرموێ:

(٣٦) خۆ ئەوكەسانەی كەبێ باوەڕن بەنیشانەكانی ئێمەو خۆیان بەگەورە دەزانیو لایاندا لەونیشانانەی ئێمەو بەقسەی ئەو پێغەمبەرانەیان نەكرد ئەوانە رەفیقی دەستەملی ئاگری جەهەنەمنو بۆ هەمیشە لەناویدا دەمێننەوە ، واتە كەس پێش رەوانەكردنی پێغەمبەران سزانادرێتو كەسیش پاش هاتنی پێغەمبەران بێ پاداشو سزا نابێت یان بەگوێی پێغەمبەران دەكەنو بەهەشت دەبەن یان بەپێچەوانەوە دۆزەخ دەبەن. ئینجا دەفەرموێ:

(٣٧) كێ هەیە ستەمكارتر لەوكەسەی كەدرۆ بەدەمی خواوە هەڵبەستێت یان بێ باوەڕ بێت بە نیشانەكانی ئەوزاتە، ئائەوانە بەشوچارەنوسی خۆیان لە كردارو رۆژیو تەمەن پێدەگات هەتا كاتێ كە نێرراوەكانی ئێمە دێنە لایان كە دەیان مرێنن فریشتەكان پێیان دەڵێن: كوا ئەوانەی لە دنیادا دەتان پەرستنو بانگتان دەكردن، بێجگە لە ﷲ؟ دەڵێن: لێمان بزر بوون، نازانین چیان لێ هات! شایەتی دەدەن لەسەر نەفسی خۆیان كە بەراستی ئەوان ئەوكاتە بێ باوەڕبوون. جا ئەو شایەتیەش بۆیە دەدەن وادەزانن بەوقسەیە رزگاریان دەبێ چونكە دانیان بەتاوانی خۆیانداناوە بەڵام تازە رزگاریان نابێتو ئەو ئیعترافو دان پێدانانە ئالەوكاتەدا بێ سودە بۆیان .

(٣٨) ﷲ پێیان دەفەرموێ: بچنەناو ئەو گەلانەوە كە كەلە پێش ئێوەدا بون لە جنۆكەو لە ئینسان، بچنەناو ئاگری دۆزەخەوە، جا ئیتر قەپوقاڵیان دەست پێ دەكات كە هەر كۆمەڵێك كەدەچن نەفرەت لەئەوی تریان دەكەنو دەڵێن: ئێوە ئێمەتان خستەناو ئاگری دۆزەخەوە ، جا ئەم شەڕە قسەیە بەردەوامە هەتا هەمویان دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە. ئینجا ئەوانەی كەلە دنیادا دواكەوتو ژێردەستەبوون رودەكەنە سەرۆكەكانیانو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ها ئەوانە ئێمەیان گومڕاكرد لە دنیادا سا دووبەرامبەر سزیان پێ بدە لەو ئاگرە. جا خوا دەفەرموێ: بۆ هەموتان چەند بەرامبەر سزا هەیە، چونكە ﷲ بەم خەڵكە وەكویەك ژیری پێداون بۆ لە دنیادا لەسەر تاوانو هەڵەپەیڕەوی لەمرۆڤی وەك خۆیان دەكەن؟

(٣٩) جا سەرۆكەكانیان بەئەوان دەڵێن: ئێوە هیچ رێزو گەورەیەكتان بە سەر ئێمەدا نیەو ئێوەش هەرگومڕا بوون وەك ئێمە ئیتر بۆ تاوانی خۆتان دەخەنەسەرئێمە؟ ئینجا پێیان

دەوترێ: دەی سزای خۆتان بچێژن بەهۆی ئەوکردارەی کە خۆتان کردوتانەو ستەمتان لێ نەکراوە.

(٤٠) بەبێگومان ئەو کەسانەی کەبێ باوەڕبوون بەنیشانەکانی ئێمەو خۆیان بەگەورە زانیوەو پشتیان کردوەتە نیشانەکانمان دەرگاکانی ئاسمانیان بۆ ناکرێتەوەو هیچ کردارێکی چاكو پاڕانەوەیان لێ وەرناگیرێتو ناچنە بەهەشتەوە هەتا وشتر نەچێت بەکونی دەرزیا ، دیارە وشتر هەرگیز بەکونی دەرزی دا ناچێت واتە چوونی ئەوانە بۆ بەهەشت شتێکی نەگونجاوە، وەئێمە هەر ئاوەها تۆڵە لەتاوانباران دەسێنین. جا چ پاڕانەوەو کرداری چاکیان وەرناگیرێ یان کاتێ کە گیانیان دەردەچێت ماوە بە رۆحەکانیان نادرێت سەرئاسمان بکەوون وەك پێغەمبەرﷺ باسی دەرچونی گیانی تاوانباری کرد کەبەرز دەکرێتەوە بۆ ئاسمان و فەرموی: {فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلَا يَمُرونَ بِهَا عَلَى مَلَإٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ إِلا قَالُوا مَا هَذَا الروحُ الْخَبِيثُ فَيَقُولُونَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَتِي كَانَ يُسَمى بِهَا فِي الدنْيَا حَتى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السمَاءِ الدنْيَا فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ فَلَا يُفْتَحُ لَهُ ثُم قَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِ﴾ /ا د، صححه الألبا /

ئینجا گیانی ئەو بێباوەڕە بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان ئەوسا ئەو گیانە بەلای هەر کۆمەڵە فریشتەیەکدا تێ بپەڕێت دەڵێن، ئەم گیانە بۆگەنە چییە؟ فریشتە بەرزکەرەوەکانیش دەڵێن: گیانی فلان کەسی کوڕی فلانە، کە بەناشیرینترین ناوی دنیای ناوی دەبەن جا هەربەم شێوە دەبێ هەتا دەیگەیەننە ئاسمانو داوای کردنەوەی دەرگای ئاسمانی بۆ دەکەن بۆی ناکرێتەوە لە پاشدا پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتەی خوێندوە ﴿لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ ..الآية﴾ }.

(٤١) بۆ ئەوان هەیە لەناو ئاگری دۆزەخ دا جێگەی ڕاخراو وداخراوو لە سەریانەوە دوکوڵ دایپۆشیون، وەهەر ئاوەها ئێمە لەستەمکاران تۆڵە دەسێنین. جێگەی ئیسراحەتیان ناوی ئاگری دۆزەخەو سێبەریان دوکەڵی سوتانی دۆزەخیانە، ئینجا اللہ باسی پاداشتی چاکان دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٢) ئەوسا ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە - کە ئێمە داوا لە هیچ نەفسێك ناکەین مەگەر بەگوێرەی توانای خۆی - ئائەوانە ڕەفیقی دەستەملی بەهەشتن کەبۆ هەمیشەیش تێیدا دەمێننەوە.

(٤٣) خۆ ئێمە هەرچی ڕقو کینەیەکیان هەبوە لە یەکتر لامان بردوە، لەناوبەهەشتدا چەندین روبار هەمیشە دەڕواتو دەڵێن:

قَالَ ٱدۡخُلُواْ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ فِي ٱلنَّارِۖ كُلَّمَا دَخَلَتۡ أُمَّةٞ لَّعَنَتۡ أُخۡتَهَاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱدَّارَكُواْ فِيهَا جَمِيعٗا قَالَتۡ أُخۡرَىٰهُمۡ لِأُولَىٰهُمۡ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ أَضَلُّونَا فَـَٔاتِهِمۡ عَذَابٗا ضِعۡفٗا مِّنَ ٱلنَّارِۖ قَالَ لِكُلّٖ ضِعۡفٞ وَلَٰكِن لَّا تَعۡلَمُونَ (٣٨) وَقَالَتۡ أُولَىٰهُمۡ لِأُخۡرَىٰهُمۡ فَمَا كَانَ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلٖ فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ (٣٩) إِنَّ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَٱسۡتَكۡبَرُواْ عَنۡهَا لَا تُفَتَّحُ لَهُمۡ أَبۡوَٰبُ ٱلسَّمَآءِ وَلَا يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ حَتَّىٰ يَلِجَ ٱلۡجَمَلُ فِي سَمِّ ٱلۡخِيَاطِۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُجۡرِمِينَ (٤٠) لَهُم مِّن جَهَنَّمَ مِهَادٞ وَمِن فَوۡقِهِمۡ غَوَاشٖۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ (٤١) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٤٢) وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلّٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي هَدَىٰنَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهۡتَدِيَ لَوۡلَآ أَنۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُۖ لَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُ رَبِّنَا بِٱلۡحَقِّۖ وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٤٣)

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ئێمەی هیدایەت داوە بۆ ئەم شوێنە باشەو ئەگەر اللہ ڕێنمایی ئێمەی نەکردایە بەراستی ئێمە نەمان دەتوانی ڕێگای هیدایەت بگرینو نەدەگەیشتین بەم نیعمەتە گەورانە، بەڵێ، بەراستی باوڕداری ڕاست هەمو چاکەیەکی خۆی هەر لە خواوە دەزانێ. هەروەك چۆن موسڵمانان لە دنیادا ڕێنمای کراون لە پاش نوێژەکانیان بڵێن: (استغفرالله) هەروەها لە پاش حەج چونکە بەم وشەیە ئەوە دەگەیەنێ کەمن ئەم ئیشەم بەوشێوەی کە پەسەندو چاكو لایق بەمەقامی زاتی اللہ بێت ئەنجام نەداوە لەبەر ئەوە پێشەکی داوای لێ بوردنی لێ دەکەم، ئینجا داوای وەرگرتن ئەگەر چی لە پاش چونە ناوبەهەشتەوە خوای میهرەبان دەفەرموێ: بەبۆنەی کردارەکانی خۆتانەوەیە بەڵام ئەوانە سۆزو میهرەبانی خوای خۆیان لەبیر ناچێتەوەو دەڵێن: ئەگەر هیدایەتی خوا نەبوایە ئێمە ڕێگای ڕاستمان چۆن دەدۆزییەوەو ئەگەر بەهۆی پێغەمبەری خواوەﷺ نەبوایە چاكو خراپەمان چۆن جیا دەکردەوە تا بەم جێگا بەنرخە بگەیشتینایە؟ ئینجا دەڵێن: بەراستی پێغەمبەرانی پەروەردگارمان هەمویان بەبەڵگەی ڕاستو ڕێکەوە هاتنەلامان، وەئەوان لەوێ بانگ دەکرێنو پێیان دەوترێت: ئائەوە ئەی باوەڕداران بەهەشتەو بەکەلەپور بەئێوە دراوەو هەر یەکەتان بەگوێرەی کرداری خۆی جێگای پێدراوە.

پێشەوای مەزنمان ﷺ دەفەرموێ:{ يُنَادِي مُنَادٍ إِن لَكُمْ أَنْ تَصِحُوا فَلَا تَسْقَمُوا أَبَدًا وَإِن لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلَا تَمُوتُوا أَبَدًا وَإِن لَكُمْ أَنْ تَشِبوا

وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ أَن قَدۡ وَجَدۡنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقّٗا فَهَلۡ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمۡ حَقّٗاۖ قَالُواْ نَعَمۡۚ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنُۢ بَيۡنَهُمۡ أَن لَّعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ كَٰفِرُونَ ﴿٤٥﴾ وَبَيۡنَهُمَا حِجَابٞۚ وَعَلَى ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٞ يَعۡرِفُونَ كُلَّۢا بِسِيمَىٰهُمۡۚ وَنَادَوۡاْ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَن سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡۚ لَمۡ يَدۡخُلُوهَا وَهُمۡ يَطۡمَعُونَ ﴿٤٦﴾ ۞ وَإِذَا صُرِفَتۡ أَبۡصَٰرُهُمۡ تِلۡقَآءَ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ قَالُواْ رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَعۡرَافِ رِجَالٗا يَعۡرِفُونَهُم بِسِيمَىٰهُمۡ قَالُواْ مَآ أَغۡنَىٰ عَنكُمۡ جَمۡعُكُمۡ وَمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٨﴾ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمۡتُمۡ لَا يَنَالُهُمُ ٱللَّهُ بِرَحۡمَةٍۚ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٤٩﴾ وَنَادَىٰٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ أَنۡ أَفِيضُواْ عَلَيۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ أَوۡ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُۚ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ حَرَّمَهُمَا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمۡ لَهۡوٗا وَلَعِبٗا وَغَرَّتۡهُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۚ فَٱلۡيَوۡمَ نَنسَىٰهُمۡ كَمَا نَسُواْ لِقَآءَ يَوۡمِهِمۡ هَٰذَا وَمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿٥١﴾

فَلَا تَهْرَمُوا أَبَدًا وَإِن لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلَا تَبْأَسُوا أَبَدًا فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَز وَجَل ﴿وَنُودُوٓاْ أَن تِلۡكُمُ ٱلۡجَنَّةُ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾﴾ /مسلم/ بانگکەرێك با نگەدەكات كە بێگومان ئیتر بۆئێوە ساغو سەلامەتیو تەندروستیە ئەوسا هەرگیز نخۆش ناكەون، وە بێگومان بۆ ئێوە زیندەگییەو هەرگیز نامرن، وە بێگومان ئیتر ئێوە هەر گەنج دەبنو هەرگیز پییرنابن، وە ئیتر ئێوە لەناو نازو نیعمەتدا دەبنو هەرگیز ناكەونە ناخۆشیەوە ئەوەیە فەرمودەی خوای بەدەسەلاتو بەشكۆ: ﴿ئەوە ئەو بەهەشتەیە كەبە میرات پێماندراون بەهۆی ئەوكردارانەی كە كردوتانە﴾}

ئەوەی راستی بێ كەس بەكردەوەی خۆی شایەنی بەهەسشت نیە بەلاّم كاتێ خوا بەسۆزو میهرەبانی خۆی خستیە بەهەشتەوە چونكە باوەڕدار بووە هاوەڵی بۆ خوا دانەناوە ئینجا لە بەهەشتا هەركەس بەگوێرەی كردەوەی خۆی كە چەند بەرامبەركراوەتەوە بۆی پلەی پێ دەدرێت ئەوەتە پێشەوای مەزنمان ﷺ ئەم راستیە باس دەكاتو دەفەرموێ: {وَاعْلَمُوا أَنْ لَنْ يُدْخِلَ أَحَدَكُمْ عَمَلُهُ الْجَنةَ وَأَن أَحَب الْأَعْمَالِ إِلَى اللهِ أَدْوَمُهَا وَإِنْ قَل /متفق عليه/ بزانن بەراستی هیچكام لە ئێوە كردەوەكەی نایباتە بەهەشتەوە ـ وتیان: تۆیش ئەی پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: بەڵێ، منیش بەلاّم خوا بەسۆزو فەزڵی خۆی منی داپۆشیوە ـ وەبزانن كە خۆشەویسترین كردار لەلا ﷲ ئەوەیە كە بەدەوام بێت باكەمیش بێت}

جا وەكو باسی چونە دۆزەخی بێ باوەڕانو چونە بەهەشتی باوەڕدارانی كرد لێرەدا گفتوگۆیەكی ئەو دوو كۆمەڵەمان بۆتۆماردەكاتو وەكو وێنەیەكی رابوردو وەبەرچاومان دەخاتو دەفەرموێ:

﴿٤٤﴾ پیاوانی بەهەشت بانگ دەكەنە پیاوانی دۆزەخیو دەڵێن: بەراستی ئێمە ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان كە بەهەشت بو دەستمان كەوت جا ئایا ئێوەش ئەو هەڕەشەی خوای خۆتان كە دۆزەخ بو دەستتان نەكەوتووە؟ دەڵێن بەڵێ، راست بو كەوتینە ناوقۆرتی بەدبەختیەوە ئینجا بانگ كەرێك لەوێدا لە ناو هەمو خەڵكدا بانگ دەكاتو دەڵێت: ئەی لەعنەتی خوا لە ستەم كاران. جا ستەم كارانمان بۆرۆشن دەكاتەوەو دەفەرموێ:

﴿٤٥﴾ ئەوكەسانەن كە ڕێگەی بلاّوبوونەوەی رێبازی ﷲ دەگرنو ئەو رێبازەی خوا بەشێوەیەكی لار پیشان دەدەنو لەبەرچاوی خەڵك ناشیرینی دەكەن تا خەڵكی لێ بتارێنن وەك ئەمڕۆ ، كە بە چاوی خۆمان دەبینینو بەگوێ خۆمان دەیبیسین كە چی دەوترێت بەئایینو بەیاسا بەنرخەكانی ، بۆ نمونە،دەستی دز بەوهەمومەرجەی كە بۆی دانراوە ئەگەر ببڕێت تاوانە بەلاّم لە ناو بەرمیلی بزماردا بەپانكە بسوڕێتەوە تا گۆشتی لە ئیسقانی جیادەكاتەوە یان شیشە لە دوایدا ووردبكرێت ، یان سەری بریندار بكرێتو مێرو بكەنە سەری ، یان سەگی هار بكرێتە لای تا بەكەیفی خۆی گیانی دەردەكات ودەیان رەفتاری شەرماوەری تری وا كەمرۆڤ شەرم دەكات لەنوسینی، بەڵێ ، ئائەمانە چاكنو پارێزگارین لەمافی مرۆڤـ ؟!! ئاشكرایە ئەمانە هەر خوا دەیان ناسێتو دەفەرموێ: وەئەوان بەرۆژی دوایی بێ باوەڕن. جا دەفەرموێ:

﴿٤٦﴾ لە بەینی ئەمانیشا پەردەیەك هەیە ئەوە نەبێت كە ئاگری دۆزەخ بێتە سەرەوەو بەهەشتیان ئازاریان پێ بگات بەلاّم ئەم پەردەیە رێگا لە بینینو قسەكردن ناگرێت جا ئەگەر كابرای بەهەشتی لە سەروی هەمو بەهەشتیانەوە بێتو دۆزەخیش لە خوارووی هەمو دۆزەخیانەوە بێت هەركاتێك ویستیان قسە لەكەڵ یەكتردا بكەن دەتوانن، كە ئەم شێوەیە لە جیهازەكانی ئەمڕۆ گەلێك پێشكەوتو ترە چونكە لەو رۆژەدا هەمو كەسێك دەتوانێ قسە لەگەڵ ئەوی ترا بكاتو دەیبینێو وەلاّمی راستەوخۆش وەردەگرێتەوە وەك لەم داستانەداو لە ئایەتی (٥٤تا٥٧الصافات) تۆمار كراوە.

ئینجا خوا دەفەرموێ: لەسەر ئەعراف كە شوێنێكە لە نێوان بەهەشتو دۆزەخ دا پیاوانێك لەوێدان كە لەسەر تاوان راگیر كراون، هەندێك دەڵێن: ئەوانە چاكەو خراپەیان وەك یەكە بۆیە

لە وێدا ماونەتەوە کە ئەو پیاوانە بەرواڵەت هەردوولا واتە بەهەشتی و دۆزەخیەکان دەناسن، وە بانگی ئەهلی بەهەشت دەکەنو دەڵێن: سەلامتان لێ بێ، ئێوە چونەتە بەهەشتەوەو لە هەمو ناخۆشیەکان رزگارتان بو، ئەم ئەهلی ئەعرافە تائیستا نەچونەتە بەهەشتەوەو بەتەمان کە بچنە ناویەوە. ئەم کۆمەڵەی ئەعراف لەوێدا دەمێننەوە تا ﷲ، بەگەورەی خۆی چاوپۆشیان لێ دەکات ئینجا دەچنە بەهەشتەوە.

(٤٧) ئەوسا هەرکاتێك روویان بەرەولای دۆزەخیان بسوڕێنرێتو چاویان بەوەزعیان بکەوێت دەڵێن: پەروەردگارمان هەرگیز لە ریزی ستەمکاراندا حیسابمان مەکە.

(٤٨) جا ئەو تاقمەی ئەعراف بانگ دەکەنە پیاوانێك کە بەرواڵەت دەیان ناسن لەناو دۆزەخداو دەڵێن: هیچ سودی پێ نەدان زۆری ژمارەو هێزو دەسەڵاتو ئەولوتبەرزیو خۆبەگەورە زانینەتان. جا هەردوچاری سزای پاشەرۆژوو تۆڵەی خودا بوونو دەڵێن:

(٤٩) ئایا ئەوە ئەوانە نەبون کە ئێوە سوێندتان دەخوارد کە ناگەن بەرەحمەتی ﷲ؟ مەبەستیان باوەڕدارانێکە کە بێ باوەڕان لە دنیادا گاڵتەیان پێ دەکردن. دەی خۆ بەئەوان وترا: بچنە بەهەشتەوە ، هیچ ترسێك بۆ ئێوەنیەو لەمەولاش هیچ خەمێکیش ناخۆن. ئەمە گفتوگۆی تاقمی ئەعراف بو لەگەڵ دۆزەخیەکاندا ئاشکرایە کە ئەوان بێجگە لە دان پێدا نان هیچ وەڵامێکیان نیە. ئینجا

(٥٠) دۆزەخیەکان بانگ دەکەنە بەهەشتیەکان چ خزمو کەسو کاریانن کە دەیان ناسنەوە لە بەهەشتدا یان تێکڕای بەهەشتیان بێ داوایان لێ دەکەنو دەڵێن: هەندێك لە ئاو برژێنن بەسەرماندا بەڵکوکەمێك تینومان بشکێتو تۆزێك فێنك ببینەوە یان هەندێك لەو خواردنەی کە خوا پێی داون واتە داوای ئاو خواردنیان لێ دەکەن ئەوانیش وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن: بەبێگومان کە خوا خواردنو خواردنەوەی بەهەشتی لە کافران قەدەغەکردوە،

(٥١) ئەو کافرانە کە دینەکەی خۆیان کەبەرنامەی ئیسلام بو بەگاڵتەو گەمە گرتبویان و زۆر بەسوکی تەماشایان دەکردو ژیانی دنیا مەستو مەغروری کردبون دەی وا ئێمەش ئەمڕۆ ئێوە لەبیری خۆمان دەبەینەوە هەروەك چۆن ئەوان لە دنیادا **یەکەم**: گەیشتن بەم رۆژەی خۆیانیان لە بیر خۆیان بردەوەو گوێیان پێ نەدا با هەر لە ناوئەو سزاو عەزابەدا بمێننەوە.

وَلَقَدْ جِئْنَاهُم بِكِتَابٍ فَصَّلْنَاهُ عَلَىٰ عِلْمٍ هُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا تَأْوِيلَهُ ۚ يَوْمَ يَأْتِي تَأْوِيلُهُ يَقُولُ الَّذِينَ نَسُوهُ مِن قَبْلُ قَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ فَهَل لَّنَا مِن شُفَعَاءَ فَيَشْفَعُوا لَنَا أَوْ نُرَدُّ فَنَعْمَلَ غَيْرَ الَّذِي كُنَّا نَعْمَلُ ۚ قَدْ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَفْتَرُونَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَىٰ عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ ۗ أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴿٥٤﴾ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً ۚ إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ ﴿٥٥﴾ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا ۚ إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِّنَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٥٦﴾ وَهُوَ الَّذِي يُرْسِلُ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۖ حَتَّىٰ إِذَا أَقَلَّتْ سَحَابًا ثِقَالًا سُقْنَاهُ لِبَلَدٍ مَّيِّتٍ فَأَنزَلْنَا بِهِ الْمَاءَ فَأَخْرَجْنَا بِهِ مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ ۚ كَذَٰلِكَ نُخْرِجُ الْمَوْتَىٰ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٥٧﴾

**دووهەم**: بە هۆی ئەوەی کە ئینکاری نیشانەکانی ئێمەیان دەکرد. جا ئەمڕۆ ئاوایان لەگەڵدا دەکرێت، هەروەکو لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە کە ﷲ، لە دوا رۆژدا بەبەندەی خۆی دەڵێ: { أَيْ فُلْ أَلَمْ أُكْرِمْكَ وَأُسَوِّدْكَ وَأُزَوِّجْكَ وَأُسَخِّرْ لَكَ الْخَيْلَ وَالْإِبِلَ وَأَذَرْكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ فَيَقُولُ بَلَى قَالَ فَيَقُولُ أَفَظَنَنْتَ أَنَّكَ مُلَاقِيَّ فَيَقُولُ لَا فَيَقُولُ فَإِنِّي أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي/ مسلم/ واتە: ئەی فلان، ئایا من هاوسەرم پێ نەدایت؟ ئایا رێزم لێ نەگرتی؟ وەئایا چارەویو حوشترم بۆ رام نەکردی ، وە تۆم کرد بەگەورەو پەیرەویکراووچواریەکت وەردەگرت ؟ یەژێ: بەڵێ، خوا دەفەرموێ: ئایا وات دەزانی دەگەیتەلام؟ دەڵێ: نەخێر. خوا دەفەرموێ: ئەمڕۆیش ئێمە تۆ لە بیر دەبەینەوە لەوسزایەدا وەك چۆن تۆ ئێمەت لە بیربردەوە}

(٥٢) بەحەقیقەت ئێمە کتێبێکی گەورەمان بۆهێنان کە ئەم قورئانە بو جا هەمو شتێکمان رۆشنکردەوە لەسەرزانیاریو زانستیانە نەك هەڕەمەکی ، کە ئەو کتێبە رێنیشاندەرو سۆزو بەرەکەتی خوایە بۆ گەلێ کە باوەڕ دێنن. بەراستی ئەم قورئانە رێ پیشاندەروسۆزە بۆ هەمو کەسێك بەڵام چونکە تەنها باوەڕداران سودی لێ وەردەگرن وەك ئەوە وایە کە تەنها بۆئەوان هاتبێ بۆیە فەرموی: بۆگەلێ کە باوەڕدێنن. ئەمەبزانە بۆمانای ئەوئایەتانەی کەلەم شێوەیە دەچن ، ئینجا دەفەرموێ:

(٥٣) ئەوان هەرچاوەڕێی هاتنەدی ئەو شتەن کە لەوکتێبەدا پێیان وتراوە جا ڕۆژێك کە ئەوە بێتە دی ئەوکەسانەی کە لە پێشدا ئەوەیان لە بیر چوەتەوە کە پەیڕەوی ئەم قورئانە بکەن ئەو ڕۆژە دەڵێن: بەحەقیقەت پێغەمبەرانی پەروەردگارمان بەبەڵگەی حەقو ڕاستەوە هاتن بەڵام ئێمە بەگوێمان نەکردن ، جا ئایا ئێستا شەفاعەت کەرێك هەیە شەفاعەتمان بۆ بکات تالەم سزایەرزگارمان بکات؟ یان ئێمە بگەڕێننەوە بۆ دنیا تاجۆرێکی تر ڕەفتاربکەین کە جیابێ لەو کردارەخراپانەی کە کردومانە؟ واتە لەوێ دان بەهەڵەی خۆیاندا دەنێنو دەزانن کە ئیشەکانیان خراپ بوە بەڵام چ سودێکی هەیە ئەو ئیعترافو دان پێدانانە؟ بەڕاستی ئەوان نەفسی خۆیان دۆڕاندوەو ون بوو لێیان ئەو درۆو کەڵەك بازیانەی کەلە دنیادا ئەنجامیان دەداو هیچ پەرستراوێکیان تکایان بۆ ناکات. پێویستە بزانین کە ئەم سورەتە مەکییانە بەزۆری داکۆکییان لەسەر سێ شتی سەرەکییە. یەکەم: تەوحیدویەکخواناسی. دووهەم:ڕۆژی دوایی و زیندوبونەوە. سێهەم: پێغەمبەرایەتی(المبدأ،الميعاد، النبوة) وەدەیانەوێ ئەم سێ شتە لە مێشکی مرۆڤ دا جێگیربکەن چونکە بنچینەوئەساسی ئایینن تا ئەم سێ شتە لە مرۆڤدا بەرێکوپێکی دانەمەزرێت هەرچییەك بکرێت بێسوودە ، جا هەر سورەتێك بەشێوەیەکی تایبەتی خۆی باسیان دەکات، جاوا جارێکی تر لە سەرەتاوە(المبدأ ) دەست پێدەکاتو دەفەرموێ:

(٥٤) بێگومان پەروەردگارتان (اللَّهُ) یە کە ئاسمانانو زەوی دروستکردوە لەشەش نۆبەتەدا ، بەڵێ، (يوم)ێ کە ئەمڕۆ ئێمە دەیناسین بریتیە لەوەی کە شەوو ڕۆژ دێت، خۆ شەوو ڕۆژ ئەوکاتە نەبوە جا دەگونجێ لە شەش کاتدا بێ کە هەرکاتێ بەئەندازەی ئەمڕۆژەی ئێمەبوبێت ، بەهەرحاڵ خوا ئەم ئاسمانانەو زەوی بەیەکجار دروست نەکرد ـ ئەگەرچی بۆ ئەویەکسانەوهیچ شتێك لەلای ئەوزاتە سەختنیە ـ تا مرۆڤ تێ بگەیەنێ کە کات پێویستەو ئیش بەپەلە نابێ، ئەگەر پشودان نەبێ لەکاریدا بۆی ناچێتە سەرو زووکۆتایی بەتەمەنی دێ. ئینجا دەفەرموێ: لەپاشا اللَّهُ سەرکەوت بۆ سەر عەرش بەو شێوەی کە خۆی دەیزانێتو ئێمە چۆنیەتەکەی نازانین وەکو ئیمامی مالك دەفەرموێ:(سەرکەوتن شتێکی دیارییە چۆنیەتیەکەی نەزانراوەو باوەڕبوون بەو شتە پێویستەو پرسیارکردن لەوبارەوە داهێنراو(بدعە)یە، ئێمەش هەربەو شێوەیە کە هاتوە بێ لێکۆڵینەوەلێی باوەڕمان پێی هەیە. شەو ڕۆژ دادەپوشێ هەریەکەیان بەپەلە ڕادەکات بەشوێنی ئەوی ترداو ڕۆژو مانگو ئەستێرەکان ئەمانە هەمویان گەردن کەچنوکاری خۆیان بە فەرمانی ئەودەبەن بەڕێوە چۆنی بۆ داناون هەریەکەیان بەوشێوەیە لە شوێنی خۆیدا ئیش دەکات دەی ئاگاداربن مادام هەر خوایە دروستکەری زەویو ئاسمانەکانو شەوو ڕۆژ دەگۆڕێتو خۆرو مانگو ئەستێرەکان هەمویان گەردن کەچن بۆیو لەو ئیشانەدا هیچ هاوبەشێکی نیە ، دەی دەبێ هەروەهابێ لە بڕیارو فەرمانەکانیدا واتە ، ئەگەر باوەڕتان بەخالقیەتی خوا هەیە هەردەبێ ئاوایش باوەڕتان بەفەرمانەکانی بێ جاهەروەك لە دروستکردندا هاوبەشی نیە نابێ لەیاساو بەرنامەی ژیانی خەڵکدا کەسێکی تر بکرێت بەهاوبەشو شەریکی، ئابەو شێوەیە یاسا دەست کردەکان قەدەغەدەکات چونکە بڕیارو یاسایەکن لە بەرانبەر بڕیارو یاسای خودادا، ئینجا دەفەرموێ: خێرو بەرەکەتی زۆرە پەروەردگاری عالەم. ئەوسا دەفەرموێ:

(٥٥) هاواربکەنە پەروەردگارتان بەگەردنکەچیوبە هێواشیەوە بێگومان ئەوزاتە بێ بەندو باروتەجاوەزکارانی خۆش ناوێت. تەنانەت لەدوعاو پاڕانەوەشدا زیاد لە سنور شتێکی خراپەو خوا پێی خۆش نیە ، چ بپاڕێتەوەو داوای پلەی پێغەمبەران بکات یان داوای بچڕانی خوێشاوەندی بکات، پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی:{ إنَّهُ سَيَكُونُ قَوْمٌ يَعْتَدُونَ فِي الدعَاءِ وَقَرَأَ هَذِهِ الآيَةَ ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا وَخُفْيَةً إِنَّهُ لَا يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ. / ا د وابو داود، حسنه الالبا / بەڕاستی بەم زوانە گەلێك دەبێ کەلەپاڕانەوەدا لە سنور تێ دەپەڕێت. وەئەم ئایەتەی خوێندەوە(ادْعُوا رَبَّكُمْ تَضَرُّعًا...)

(٥٦) ئەوسا خراپەنەکەن لەسەر زەویدا پاش ئەوەی کە بارودۆخی زەوی سەقامگیروچاکەو هاواربکەنە خوداو بە ترسو بە تەماعەوە بیپەرستن ، بترسن کە لێتان خۆش نەبێتو تەمایشتان هەبێ کە لێتان خۆش ببێت. واتەمرۆڤی موسڵمان نابێ ئەمین بێت لە مەکری خوداو ئایندەی خۆیو نابێت نائومێدیش بێت لە سۆزی خودا. وەك ئیمامی عومەر ؓ دەڵێ: ئەگەر لە ئاسمانەوە دەنگێ بێتو بڵێ: هەمو کەس دەچنە بەهەشتەوە بێجگە لە یەك کەس من دەترسم ئەوکەسە بم، وەئەگەر بڵێت: هەمو کەس دەچێتە جەهەنم بێجگە لەیەك کەس من ئومێدەکەم ئەوکەسە من بم. واتە باوەڕدارهەمیشە لە نێوان ترسو ئومێدداپە بە بێگومان سۆزی اللَّهُ نزیکە لە چاکەکارانەوە ئەوانەی پەیڕەوی فەرمانەکانی دەکەنو دوور دەکەونەوە لە تاوانو سەرپێچیو هەمیشە خوای خۆیانیان لەبەر چاوە. ئینجا اللَّهُ نیعمەتێکی تری خۆیمان پیشان دەداتو دەفەرموێ:

(٥٧) خوا ئەو زاتەیە کە با دەنێرێت کەئەو بایە موژدە دەرە پێش هاتنی رەحمەتی ئەوزاتە کەبارانە ، هەتا ئەوکاتەی کەئەو بایە هەوری قورس بەهۆی زۆری ئاوەوە هەڵدەگرێت کە پاڵی پێوەدەنێین بۆ شارێکی مردوی وشکی بێ گژوگیا کە پێویستی بەو ئاوە هەیە ئەوسا ئێمە بەهۆی ئەو هەورەوە ئاو رەوانە دەکەین بۆ ئەوشارە جا بەهۆی ئەو ئاوەوە لەهەمو جۆرە بەروبومێك دەردەهێنین ، هەرئاوەها مردویش زیندو دەکەینەوە . واتە کەسێ کە توانای هەڵگرتنی ئەو ئاوەزۆرەی هەبێو نایەڵێ برژێت تا جێگای مەبەست لەوێش ئەو زەویە وشکە ئاوبداتو ئەو هەموشینایو گیایە سەوزبکات بۆناتوانێ مردو زیندو بکاتەوەو چ شتێك هەیە کەرێگای بگرێت؟ بۆیە دەفەرموێ: بەڵکو ئێوەش بیر بکەنەوە کە چۆن بەو بارانە ئەو هەموو زەوییە زیندو دەکەینەوە. بەراستی مەسەلەی باران شتێکی زۆر عەجیبو سەر سوڕهێنەرە هەر لە هەڵگرتنی ئەو ئاوە لەو بەرزاییەداو پاڵ نانیو ناردنە خوارەوەی بەشێوەی دانەدانە! ئەو ئاوە بۆ نارژێت یان کاتی رژان کێ وا ورد وردی دەکات؟ چونکە ئەگەر بەیەکجار بێتەخوارەوە نەك سودی نابێت بەڵکو ئەوناوەچەیە وێران دەکات. بەراستی سەرپەرشتو دروستکاری زاناو بەئاگاو خاوەن دەسەڵاتە (العليم الخبير القدير).

(٥٨) شاری پاك گیایەکی جوان سەوز دەکات بەئیزنی خوا بەڵام شاری پیس بەروبومێکی پیسی دەبێت، مەبەست لێرەدا باوەڕدارو بێ باوەڕە، هەیە بەم قورئانە بەو پەڕی خۆش بەختی دەگات، وەهەیشە بەو پەڕی بەدبەختیو رۆژڕەشی دەگات ، چونکە یەکەمیان پەیرەوی دەکاتو دووهەمیان دژایەتی، ئینجا دەفەرموێ: هەر ئاوەها ئێمە نیشانەکانی خۆمان دەگۆڕین بۆ گەلێك کە شوکرو سوپاسمان بکات. هەرلەم بارەوە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:{ مَثَلُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ مِنْ الْهُدَى وَالْعِلْمِ كَمَثَلِ الْغَيْثِ الْكَثِيرِ أَصَابَ أَرْضًا فَكَانَ مِنْهَا نَقِيَّةٌ قَبِلَتْ الْمَاءَ فَأَنْبَتَتِ الْكَلَأَ وَالْعُشْبَ الْكَثِيرَ وَكَانَتْ مِنْهَا أَجَادِبُ أَمْسَكَتِ الْمَاءَ فَنَفَعَ اللهُ بِهَا النَّاسَ فَشَرِبُوا وَسَقَوْا وَزَرَعُوا وَأَصَابَتْ مِنْهَا طَائِفَةً أُخْرَى إِنَّمَا هِيَ قِيعَانٌ لَا تُمْسِكُ مَاءً وَلَا تُنْبِتُ كَلَأً فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينِ اللهِ وَنَفَعَهُ مَا بَعَثَنِي اللهُ بِهِ فَعَلِمَ وَعَلَّمَ وَمَثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذَلِكَ رَأْسًا وَلَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللهِ الَّذِي أُرْسِلْتُ بِهِ /رواه الشيخان والنسائي/ واتە: وێنەی ئەو شتەی کەمنی بۆرەوانە کراوە لەرێنمایو زانین وەکو بارانێکی زۆر وایە کە بدات لە زەوییەك جا ئەو زەوییە هەندێکی چاك بێو ئاوەکە وەرگرێتو لەوەرو گیای زۆر سەوزبکات وەهەندێکیشی هەر ئاوەکە وەرگرێت خوا بەهۆی ئەوەوە سود بەخەڵك بگەیەنێت جا ئاوی لێی بخۆنەوەو شتی پێ ئاو بدەنو

وَٱلۡبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخۡرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذۡنِ رَبِّهِۦۖ وَٱلَّذِي خَبُثَ لَا يَخۡرُجُ إِلَّا نَكِدٗاۚ كَذَٰلِكَ نُصَرِّفُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَشۡكُرُونَ ﴿٥٨﴾ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥٩﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٦٠﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي ضَلَٰلَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦١﴾ أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ أَوَعَجِبۡتُمۡ أَن جَآءَكُمۡ ذِكۡرٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنكُمۡ لِيُنذِرَكُمۡ وَلِتَتَّقُواْ وَلَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٦٣﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ۞ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۗ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي سَفَاهَةٖ وَإِنَّا لَنَظُنُّكَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٦٦﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ لَيۡسَ بِي سَفَاهَةٞ وَلَٰكِنِّي رَسُولٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٧﴾

شتی پێ بڕوێنن وەهەندێکیشی دەشتبێو نەئاوهەڵگرێو نەگیایش سەوزبکات. یەکەمو دووهەمیان: وێنەی ئەوکەسەیە کە شارەزای ئاینی خودابێو سود لەوشتە وەرگرێت کە خوا منی بۆ رەوانە کردوە جا خۆی فێربوبێو خەڵکیشی فێرکردبێت وەسێهەمیان: وێنەی ئەوکەسەیە کە هیچ سودێك وەرنەگرێتو سەری بەوە بەرزنەبێتەوەو ئەو رێنماییەی خوای وەرنەگرتبێ کە منی بۆرەوانە کراوە. ئینجا خوا باسی داستانی چەند پێغەمبەرمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٩) بەحەقیقەت نوحمان رەوانە کرد بۆ لای قەومەکەی. نوح عليه السلام یەکەم پێغەمبەرە لەپاش ئادەم بۆ ئەهلی زەوی جا ئەویش بەگەلەکەی خۆی وت: ئەی گەلی من الله بپەرستن چونکەهیچ پەرستراوێکی راستەقینەی تر بێجگە لە ئەو بۆ ئێوە نیە، بەبێگومان ئەگەر ئێوە هەر لەسەر ئەو بەرنامە هەڵەیەی خۆتان برۆن من دەترسم کە دوچاری سزای رۆژێکی گەورە ببن کە رۆژی دواییە.

(٦٠) هەمیشە ئەوانەی باڵا دەستو سەرمایە دار بوون دژایەتی ئاینیان کردوە چونکە خۆیان بەپیاو ما قوڵ ودەم راستی ئەو گەلە داناوەو ژیانیان لەسەر شانی ئەوان بووەو زانیویانە کە ئەگەر پەیرەوی پێغەمبەر بکەن ئیتر ئەوان ئەوپلەیان نابێ بۆیە

أُبَلِّغُكُمْ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنَا۠ لَكُمْ نَاصِحٌ أَمِينٌ ﴿٦٨﴾ أَوَعَجِبْتُمْ
أَن جَآءَكُمْ ذِكْرٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ مِّنكُمْ لِيُنذِرَكُمْۚ
وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ قَوْمِ نُوحٍ وَزَادَكُمْ
فِي ٱلْخَلْقِ بَصْۜطَةًۖ فَٱذْكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ
﴿٦٩﴾ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِنَعْبُدَ ٱللَّهَ وَحْدَهُۥ وَنَذَرَ مَا كَانَ
يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَاۖ فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ
﴿٧٠﴾ قَالَ قَدْ وَقَعَ عَلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ رِجْسٌ وَغَضَبٌۖ
أَتُجَٰدِلُونَنِي فِيٓ أَسْمَآءٍ سَمَّيْتُمُوهَآ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُم
مَّا نَزَّلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَٰنٍۚ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ
ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿٧١﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا
وَقَطَعْنَا دَابِرَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ وَمَا كَانُواْ مُؤْمِنِينَ
﴿٧٢﴾ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ
مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن
رَّبِّكُمْۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةًۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ
فِيٓ أَرْضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾

وتيان: بێگومان ئێمه تۆ دەبینین كه له گومڕاهییەكی ئاشكرادای
.

(٦١) ئەی گەلی من ، بەراستی من هیچ جۆرە گومڕاهیەكم پێوە نیەو سەرم لێ نەشێواوە بەڵام من نێرراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەوە .

(٦٢) من پەیامەكانی پەروەردگاری خۆمتان پێ رادەگەیەنم‌و ئامۆژگاری كەرێكی دڵسۆزم بۆتان، وەمن شتانێك لەلایەن خواوە دەزانم كه ئێوە نای زانن .

(٦٣) ئایا ئێوە سەرتان سوڕماوە لەو ئامۆژگاریەی كەلەلایەن پەروەدگارتانەوە هاتوەتەلای پیاوێك كەلە خۆتانە تا بتان ترسێنێ له پاشەرۆژو لەتۆڵەی خوا له خراپەكارو ستەمكار تا ئێوەش خۆتان بپارێزن له تاوان‌و هەڵە بۆئەوەی رەحمتان پێ بكرێت‌وپاشە رۆژێكی خۆشتان ببێت ، وەبۆ ئەوەی كه خوا بەزەیی بێتەوە پێتانداو له هەردوو ژیان بەخۆشی بتان ژێنێ كه چی ئەوان لەباتی سوپاس‌و ڕێز لێ گرتن ،

(٦٤) ئەوسا ئەوان بەدرۆیان خستەوەوباوەڕیان پێ نەكرد جا ئێمەش خۆی و ئەو كەسانەیش كه لەگەڵیابون لەناو كەشتیەكەدا رزگارمان كردن‌و ئەوانەی كه بێ باوەڕبون به نیشانەكانی ئێمە له دەریاداخنكاندنمان بێگومان كەئەوانە گەلێكی كوێربون‌و راستیان نەدەدی بەم شێوەیە خوا تۆڵەی له تاوانباران سەندەوە بۆ دۆستەكانی، یەكەمیان لەناوچون‌و دوهەمیان رزگاربون. ئینجا دەچێتە سەر داستانی هودو دەفەرموێ:

(٦٥) هەروەها رەوانەمان كرد بۆ گەلی عاد براكەیان كه هود عليه السلام بوو. كەواتە دروستە له جیهەتی ئینسانیەوە موسڵمان به فەلە یان جوو بڵێت برا. وتی: ئەی گەلی خۆم خودا بپەرستن بەراستی بێجگە لەو خودایە هیچ پەرستراوێكی راستەقینەی تر نیەبۆئێوە، ئایا ئێوە ناترسن له خودا بەخۆپاراستن لەو شتانەی كه دەبێتە هۆی رق‌و قینی ئەوزاتە؟

(٦٦) ئەوانەی كه ئەشرافی گەلەكەبون وەڵامیان دایەوەو وتیان: بەبێگومان ئێمە تۆ دەبینین وای له ناو سەفاهەت‌و بێ ئەقڵی دای‌و بێشك كه ئێمە وا دەزانین تۆله درۆزنانبیت. تەماشابكەن‌و بزانن پیاوی گەورەو ناوداری هەمو سەردەمێك چۆن بوون سەبارەت به ئایین‌و پێغەمبەران ئەمڕۆیش‌و هەتا قیامەتیش هەروا دەبێ، ئینجا هود عليه السلام وەڵامی دانەوەو

(٦٧) وتی: ئەی گەلی من والله ی من بێ عەقڵ نیم‌و ئەم قسانە له خۆمەوە ناكەم بەڵام بەراستی بزانن كەمن نێرراوم لەلایەن پەروەردگاری جیهانەوە.

(٦٨) كه من پەیامەكانی پەروەردگارم بەئێوە دەگەیەنم‌و من بۆ ئێوە ئامۆژگاری كەرێكی ئەمین‌و دەست‌و دەمپاكم.

(٦٩) ئایا ئێوەسەرتان سوڕماوە لەو ئامۆژگاریەی كەلەلایەن پەروەدگارتانەوە هاتوەتەلای پیاوێك كەلە خۆتانە تا بتان ترسێنێ له پاشەرۆژو لەتۆڵەی خوا له خراپەكارو ستەمكار ، وە بیر بكەنەوە لەوكاتەی كه الله ئێوەی كرد بەجێنشینی گەلی نوح كەئەوانی خنكاندو ئێوەی دانا لەسەر زەوی‌و خوا به ئێوەی لەوان زیاتر بەخشیوە لەلایەن بەژن‌و باڵاو هێزو دەسەڵاتەوە دەی بیر بكەنەوە له نیعمەتەكانی خوا بەڵكو ئێوەش رزگار ببن .

(٧٠) وتیان: ئایا تۆ هاتویت بۆلای ئێمە كه الله بەتەنهایی بپەرستین‌و واز بێنین لەو هەمو خوایانەی كەباب‌و باپیرانمان پەرستویانە؟ بەداخەوە ئەمڕۆیش بەهەمان شێوە دژایەتی خواو ئاینی دەكرێت كاتێ پێیان دەوترێت: تەنها هاوار لەخوا بكەن‌و تەنها ئەو بەجێگای ئومێد بزانن گورج پەلەمار دێنن‌و دەڵێن: تۆ باب‌و باپیرانی ئێمە سوك دەكەیت، كاتی خۆی ئەوان هاواریان دەكردە فلان‌و فیسارو ئێمەش وازی لێ ناهێنین، هەروەكو لێرەدا بەهودیان وت. دەی ئەگەر راست دەكەیت بیهێنە بۆمان ئەوەی

کەهەڕەشەمانی پێ دەکەیت واتە دەی با سزامان بۆ بێت ئەگەر لە راستگۆیانی .

(٧١) وتی: بەراستی ئیتر بەهۆی ئەو ئیشەی خۆتانەوە غەزەب وسزا لەلایەن پەروەردگارتانەوە مسۆگەر بوە بۆتان ئایا ئێوە لەبارەی ناوانێکەوە کە خۆتانو باو باپیرانتان داتان ناوە دەمەدەمە لەگەڵ مندا دەکەن؟ من هیچ باکم نیە چونکەخوا لەو بارەوە هیچ بەڵگەیەکی رەوانە نەکردوە جائێوە چاوەڕێ بکەن بێگومان منیش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕێ دەکەم تاکو ئەو عەزابە دێت. دیارە سزایان بۆ هات، بۆ یە دەفەرموێ:

(٧٢) جا ئێمە خۆیو ئەوکەسانەی لەگەڵ ئەودابوون بەهۆی سۆزو رەحمەتی خۆمانەوە رزگارمان کردنو ئێمە هیچمان نەهێشتەوە لەو کەسانەی کەبێ باوەڕبون بە نیشانەکانی ئێمە، خۆ ئەوان باوەڕیان نەهێنابو. بەڵێ، ئابەو شێوەیە خوا هودو پەیڕەوانی رزگارکردو بێ باوەڕانی لە ریشە دەرهێناو خەڵکی ئەو سەردەمە هاتنە جێیانو بەڵێنی خوایان دیو ئێمەش وابیستمانو بۆ کەسیش بەهانەنەماوە لەم بارەوەو تاقی کردنەوەش بەردەوامە. ئینجا خوا دەچێتە سەر داستانی پێغەمەر ساڵح عليه السلامو دەفەرموێ:

(٧٣) وەناردمان بۆ گەلی سەمود براکەیان کەساڵح بو وتی: ئەی گەلی من خوا بپەرستن بێجگە لەو خوایە هیچ پەرستراوێکی تری بەحەق نیە بەراستی لەسەر راستی من بەڵگەیەکی رونو ئاشکراتان لەلایەن خوای خۆتانەوە بۆ هاتوە کە ئەم وشترەیە کە خوا لەسەرداخوازی خۆتان پێی دان کەنیشانەیەکی گەورەیە بۆ ئێوە تا باوەڕبهێنن ئەوسا وازی لێ بێنن با بۆخۆی بلەوەڕێت لەزەوەیەکەی خواداو هەرگیز دەستدرێژنەکەنە سەری چونکە بەراستی ئەگەر دەستدرێژی بکەنە سەری سزایەکی سەخت دەتان گرێت. ئەڵێن: کە گەلی سەمود بەقسەی ساڵح باوەڕیان نەکردو داوایان لێکرد ئەگەر راست دەکەیتو پێغەمبەری خوایت بالەو بەردە وشترێك بێتەدەرەوە ساڵحیش داوای لە خوا کردو خوایش لەو بەردەی کە دیاریان کردبو وشترێکی بۆ هێنانە دەر ساڵح وتی: ئاگاتان لەو وشترە بێو دەست درێژی نەکەنە سەرو وازی لێ بهێنن با بۆ خۆی بلەوەڕێتو

(٧٤) بیر بکەنەو کە الله ئێوەی کرد بەجێنشین لە پاش گەلی عادو جێگیری کردن لەسەر زەویدا کەئیوەلە ناو شوێنە دەشتاییەکاندا قەسرتان دروست دەکەن بۆ هاوینانو چیاکانیشتان دەکۆڵیو دەتانکرد بەئەشکەوتوماڵی خۆتان لە زستاندا ، دەی

وَٱذۡكُرُوٓاْ إِذۡ جَعَلَكُمۡ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعۡدِ عَادٖ وَبَوَّأَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورٗا وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ (٧٤) قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِمَنۡ ءَامَنَ مِنۡهُمۡ أَتَعۡلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحٗا مُّرۡسَلٞ مِّن رَّبِّهِۦۚ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلَ بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ (٧٥) قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا بِٱلَّذِيٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ (٧٦) فَعَقَرُواْ ٱلنَّاقَةَ وَعَتَوۡاْ عَنۡ أَمۡرِ رَبِّهِمۡ وَقَالُواْ يَٰصَٰلِحُ ٱئۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ (٧٧) فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ (٧٨) فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَالَةَ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُحِبُّونَ ٱلنَّٰصِحِينَ (٧٩) وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ (٨٠) إِنَّكُمۡ لَتَأۡتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهۡوَةٗ مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ (٨١)

بیر بکەنەوە لەوهەمو نیعمەتانەی الله و هەرواخراپەکارانە خراپە بڵاو نە کەنەوە بەسەر زەویدا.

(٧٥) ئەوانەی کە ئەشرافو سەرمایەدارای گەلەکەی بون وخۆیان بەدەم راسو بەگەورە دەزانی وتیان: بەوکەسانەی کە لەدەست خرابوونولاوازکرابون کەباوەڕیان هێنابو لەناو ئەوگەلەدا ئایا ئێوە پێتان وایە کە ساڵح پێغەمبەری خوایەو لە ئێمە ژیرترو چاکتر دەزانن؟ وتیان بەڵێ، باوەڕمان هەیە بەوەی کە ئەوی پێ رەوانەکراوەو پێمان راستە.

(٧٦) بەڵام ئەوانەی کە خۆیان بەگەورە دەزانی وتیان: ئێمە بەوەی کە ئێوە باوەڕتان پێ هێناوە بێ باوەڕین. هەربەوەش نەوەستان بەڵکو

(٧٧) ئەوسا وشترەکەیان سەربڕیو لە فەرمانی خوای خۆیان دەرچونو دەستیان کرد بەتانەو تەشەردان لە ساڵحو وتیان: ئەی ساڵح ئەو وەعدەی کە پێت داوین کە ئەگەر وشترەکە بکوژین سزامان بۆ دێت بابێت ئەگەر راست دەکەیو یەکێکیت لە پێغەمبەران؟ جا خوا دەفەرموێ:

(٧٨) جاهەر بەدوای ئەو تاوانە گەورەی کە کردیان دەنگێکی توند گرتنی هەمویان لە ناو ماڵی خۆیاندا کەوتنو مردن. ئەو گەلەش ئاوا لەبەین چوونونەمان دەڵێن: ئەوەی کە وشترەکەی

وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًاۗ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥۖ قَدْ جَآءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْۖ فَأَوْفُواْ ٱلْكَيْلَ وَٱلْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُواْ فِى ٱلْأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَٰحِهَاۚ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَلَا تَقْعُدُواْ بِكُلِّ صِرَٰطٍ تُوعِدُونَ وَتَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِهِۦ وَتَبْغُونَهَا عِوَجًاۚ وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ كُنتُمْ قَلِيلًا فَكَثَّرَكُمْۖ وَٱنظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٨٦﴾ وَإِن كَانَ طَآئِفَةٌ مِّنكُمْ ءَامَنُواْ بِٱلَّذِىٓ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَطَآئِفَةٌ لَّمْ يُؤْمِنُواْ فَٱصْبِرُواْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ ٱللَّهُ بَيْنَنَاۚ وَهُوَ خَيْرُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨٧﴾

کوشت ناوی(قەیداری کوڕی سالیف)بو پاش کوشتنی وشترەکە تەنها سێ رۆژ ماوەدران‌و ئەو دوژمنانەی ساڵح نۆ دەستە بون بەلام هەمویان بۆ دژایەتی ئایین یەك قسەبون تائەو تاوانەیان کردو خوا تۆڵەی لێ وەرگرتن‌و لە ناوی بردن بەیەك دەنگ.

(٧٩) پێغەمبەران هەرئاوەها دڵسۆزن ئەوەتە کاتێ کەگەلەکەی دوچاری ئەو سزایە بو نەهات شادی‌و حەفلە بکات بەلکو پشتی تێ کردن‌و وتی: ئەی گەلی من بەراستی من پەیامەکەی پەروەردگاری خۆمم پێ گەیاندن‌و ئامۆژگاریم کردن‌و ئێوەم ترساند لە رۆژێکی ئاوەها بەلام ئێوە ئینسانی ئامۆژگاری کەرتان خۆش ناوێت. بەداخەوە زۆربەی خەڵك ئاوەهان‌و هەربەتاوانەوە سەرگەرمن‌و دژایەتی خواوئایین دەکەن تا خۆیان‌و خەڵکیش لەناو دەبەن. ئینجا ﷲداستانی لوتمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٨٠) کاتێ کە لوت‌عليه السلام بەگەلەکەی وت: ئایا ئێوە تاوانێك دەکەن کە هیچ کەس لە پێش ئێوەدا ئەوتاوانەی نەکردوە؟

(٨١) بێگومان ئێوە رابواردنی خۆتان لەگەڵ پیاواندا دەکەن‌و واز لە ژنانی حەلالی خۆتان دێنن بەراستی ئێوە گەلێکی لە سنور دەرچوو زیادەڕەون.

لوت کوڕی هارانی کوڕی ئازەرەو برازای ئیبراهیم پێغەمبەر بووە کە باوەڕی بە ئیبراهیم هێناو لەگەڵ ئەودا کۆچی کردوە بۆشام ئینجا خوا کردی بە پێغەمبەری خەڵکی (سەدم)و دەوروبەری، ئەویش بانگی کردن بۆ خوا پەرستی‌و واز هێنان لە تاوان‌و خراپەکاری بەتایبەت نێربازی کەتا سەردەمی ئەوان هیچ کەس لەنەوەی ئادەم ئەوکارە پیسەی نەکردبو ئەوان دایان هێنا-نەفرینی خوایان لێ بێ- لوت هەربەردەوام بو لەسەر فەرمان بەچاکەو بەرگری لەخراپە بەلام ،

(٨٢) وەلامی گەلەکەی بێجگەلەوەی کەدەیان وت: دەریان بکەن لە ولاتەکەی خۆتاندا ، چونکە ئەوان پیاوانێکن خۆیان بەپاکی رادەگرن‌و نایانەوێ کە خۆیان پیس بکەن بەو تاوانە، ئەگەر چی ئەمە قسەیەکی راستەو خوا بەدەمی ئەواندا هێناویتی بەلام مەبەستیان تانەو تەشەر لێدان بوە لە لوت‌و لە پەیرەوانی ، بەڵێ، دنیایی ئەمرۆیش ئەو تاوانە بە شتێکی سادە دەزانن‌و یاسا دەستکردەکان ماوەی پێ دەدەن‌و وەك ئافرەت پیاو لە پیاو مارە دەکەن کەلە راستیدا ئەمە بێجگە لەوەی کە تاوانە پێشێل کردنی مافی ئافرەتیشە بەلام دەهۆڵ کوتانی مافی ئافرەت ، چونکە مرۆڤانی هەوەسبازو بێ باوەڕن لەم بارەوە دەنگیان لەدەم دەرنایە بەلام لەسەر چادرو سەرپۆش کە مایەی رێزو پاراستنی ئافرەتە دنیایان پڕ لە هەیاو هو کردوە، وتراوە قالۆنچە لە بۆنی خۆش رادەکات. بەڵێ، ئەو گەلەی لوت هیچ گوێیان بە ئامۆژگاریەکانی لوت نەداو بەردەوام بوون لەسەر تاوان‌و ئیشی پیس سەر ئەنجام سزایان بۆهات وەك ﷲ دەفەرموێ:

(٨٣) ئینجاخۆی‌و ئەهلەکەیمان رزگارکرد جگە لەخێزانەکەی کەئەویش لەئەوان بو کەوتە بەر سزای خودا.

(٨٤) ئەوسا ئێمە بەردبارانمان کردن، دەی تەماشا بکەو بزانە چۆن بوو ئاکامی ئەو تاوانبارو خراپکارانە. جا ئەم تاوانبارانە سێ شتیان بەسەر هات، یەکەم: دەنگێکی توند لێیدان. دووەهەم: بەرد باران کران. سێهەم: گوندە کانیان بە خۆیان‌و دانیشتوانیانەوە سەروبن کران. لێرەدا دەرکەوت کە حیساب شەخسیەو لوت کە پێغەمبەرە مادام خێزانەکەی کە باوەڕدار نەبووە لە سزای خوا رزگار نابێ جا با کەس بەکەس‌و کاردا نەنازێ بۆ پاشە رۆژو دادگای خوا چونکە هەرکەس ئیشی چاك بکات بۆ خۆیەتی‌و هەرکەسێکیش خراپە بکات هەربۆ خۆیەتی. ئینجا ﷲ باسی بەسەرهاتی شوعەیب‌عليه السلام‌و گەلەکەیمان بۆ دەکات‌و دەفەرموێ:

(٨٥) هەروەها بۆ مەدیەن براکەیان کەشوعەیب بو بۆمان ناردن کەوتی: ئەی گەلی من خوا بپەرستن ، بێجگەلەو خوایە هیچ پەرستراوێکی راستی تر نیە بەراستی بەلگەی ئاشکرا لەلایەن

خوای خۆتانەوە هاتوەتە لاتان، ئەوانیش ئیشی خراپیان دەکرد بەتایبەت کاتێك کە شتیان بۆ خەڵك دەکێشا سوك دەیانکێشاو کاتێ بۆ خۆیانیان دەکێشا بە سەنگێکی قورس دەیانکێشا ئەمەش بەڵگەی باوەڕ لاوازیان بو  بە خواو بەرۆژی دوایی وبەڵگەی بێ ڕەحمیان بو بەرابەر بەیەکتر دەسا با پێوانەو کێشانەتان ڕێکوپێك‌و تەواوبێت زیان لە خەڵك نەدەن‌و شتی خەڵك بێنرخ‌و سووك نەکەن‌و فەساد بڵاونەکەنەوە لە سەر زەویدا پاش هاتنی ئەو هەمو پێغەمبەرانە. ئاشکرایە پاش هاتنی پێغەمبەران ئەگەر ئەو خەڵکە بەگوێی بکەن زەوی‌و وڵات بەرەو چاکی دەڕوات بۆیە دەفەرموێ: خراپە نەکەن دوای ئەوە کە زەوی چاك بوە ، ئا ئەوە چاکە بۆتان‌و تا کێشانەو پێوانەتان جوان بێ بەسودترە بۆتان ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ، چونکە لە دنیادا سودێکی حەڵاڵتان دەست دەکەوێت‌و لە پاشە ڕۆژیشدا شەرمەندە نابن، ئەم گەلەی شوعەیب (عليه السلام) دەیان سیفەتی خراپیان هەبو گرنگتریان ترازو بازی بو بۆیە پێشەکی باسی کرد ئینجا ئەو سیفەتەکانی تریان باس دەکات‌و دەفەرموێ: شوعەیب پێی وتن:

(٨٦) دامەنیشن لە سەر هەمو ڕێگایەکداو هەڕەشە لەخەڵکی بکەن‌و خەڵك مەنع بکەن لە ڕێگای خوداو نەیەڵن باوەڕبهێنن‌و بتانەوێ کەئەو ڕێگایەی خودا بەشێوەیەکی لار پیشانی خەڵکی بدەن واتە شوعەیب مەنعی کردن لە ڕێگاگرتن چ مادی بێ وەك تۆقاندنی خەڵك یان مەعنەوی بێ وەك ناشیرین پیشاندانی ئاینی خوا بەخەڵکی نەزان. وەبیر بکەنەوە لەوکاتەی کە ئێوە کەمبوون جا ﷲ زۆری کردن‌و دەسەڵاتی پێدان‌و تەماشابکەن‌و بزانن چۆن بو دواڕۆژی ئەوکەسانەی کە خراپەکاربون‌و چییان بەسەرهات؟ واتە ئەوەش بۆ ئێوە هەیە ئەگەر ئێوەش هەروا تاوان بکەن‌و بە گوێی پێغەمبەری خۆتان نەکەن.

(٨٧) خۆ ئەگەر تاقمێك لە ئێوە باوەڕی هێنا بەوەی کە منی بۆ ڕەوانەکراوەو تاقمێکی ترتان باوەڕی نەهێنا سا خۆتان بگرن تاخوا لە نێوانماندا حوکم دەکات، کە پاشە ڕۆژ بۆ پەرهێزکارانەو شەرمەندەییش بۆ بێ باوەڕانە، وە هەرئەوە چاکترینی حاکمان کە زەرەی لێ ون نابێت‌و ستەمیش لەکەس ناکات‌و هیچ کەسێکیش پێش تەواو بونی بەڵگەو نەمانی بەهانە سزا نادات، ئاشکرایە هەرکاتێ کەفسەی ڕاست‌و ڕەوا کرا لە بەرانبەر تاوانبارانەوەو وەڵامیان نەبو ئەوسا دەست دەکەن بەچاو زاق کردنەوەو هەڕەشەکردن لە پیاو چاکان‌و خێر خوازان ، ئەوەتە لێرەدا شوعەیب وتی: با خۆبگرن جا ئاگر بەربووە کەوڵیان،

(٨٨) ئەشراف‌و سەرمایە دارانی گەلەکەی‌و ئەوانەی کە خۆیان بەگەورە دەزانی وتیان: بەراستی ئەی شوعەیب تۆو ئەو

قَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَنُخۡرِجَنَّكَ يَٰشُعَيۡبُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَكَ مِن قَرۡيَتِنَآ أَوۡ لَتَعُودُنَّ فِي مِلَّتِنَاۚ قَالَ أَوَلَوۡ كُنَّا كَٰرِهِينَ (٨٨) قَدِ ٱفۡتَرَيۡنَا عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا إِنۡ عُدۡنَا فِي مِلَّتِكُم بَعۡدَ إِذۡ نَجَّىٰنَا ٱللَّهُ مِنۡهَاۚ وَمَا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّعُودَ فِيهَآ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّنَاۚ وَسِعَ رَبُّنَا كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمًاۚ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَاۚ رَبَّنَا ٱفۡتَحۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ قَوۡمِنَا بِٱلۡحَقِّ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡفَٰتِحِينَ (٨٩) وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ لَئِنِ ٱتَّبَعۡتُمۡ شُعَيۡبًا إِنَّكُمۡ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ (٩٠) فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ (٩١) ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَاۚ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ شُعَيۡبٗا كَانُواْ هُمُ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٩٢) فَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰقَوۡمِ لَقَدۡ أَبۡلَغۡتُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَنَصَحۡتُ لَكُمۡۖ فَكَيۡفَ ءَاسَىٰ عَلَىٰ قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ (٩٣) وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّبِيٍّ إِلَّآ أَخَذۡنَآ أَهۡلَهَا بِٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ لَعَلَّهُمۡ يَضَّرَّعُونَ (٩٤) ثُمَّ بَدَّلۡنَا مَكَانَ ٱلسَّيِّئَةِ ٱلۡحَسَنَةَ حَتَّىٰ عَفَواْ وَّقَالُواْ قَدۡ مَسَّ ءَابَآءَنَا ٱلضَّرَّآءُ وَٱلسَّرَّآءُ فَأَخَذۡنَٰهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ (٩٥)

کەسانەش کەلە گەڵ تۆدان دەرتان دەکەین یان دەبێ بگەڕێنەوە بۆسەر دینەکەی ئێمە، شوعەیبیش (عليه السلام) وتی: ئایا هەر دەبێ بگەڕێینەوە بۆ دینەکەتان ئەگەرچی ڕقمان لەو دینە بەتاڵەش بێت؟ واتە شتێکی دوور لە ژیریەو ئەگەر ئێمەشتی وابکەین

(٨٩) بەراستی ئێمە درۆمان بەدەمی (ﷲ) وە کردوە ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەر دینەکەی ئێوە پاش ئەوەی کە ﷲ ئێمەی لەو بیروباوەڕە چەوتە ڕزگار کردوە واتە دوای ئەوەی کە خوا ڕێنمای کردین‌و ڕێگەی ڕاستی پیشان داین هەرگیز پاشگەز بونەوە نیە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ: شوعەیب وتی: ئەوسا بۆمان نیە هیچ کاتێك بگەڕێینەوە بۆ ئەو دینە مەگەر ﷲ ئارەزۆ بکات ، کە ئێمەش وەك ئێوە گومڕا بکات وسەرمان  لێ بشێوێنێ واتە خوا هەرچی ئارەزۆ بکات دەیکات‌و پەروەردگارمان  زانیاری بەسەر هەمو  شتێکدا هەیەو هیچ شتێك لەزانیاری ئەودەرناچێت. جا ئێوە هەرچی دەکەن بیکەن ئێمە بێمنەتین چونکە ئێمە تەنها بەخوا پشتمان بەستوەو هەرکەسێکیش بەراستی پشت ببەستێت بەخوا، خوا بەسە بۆی، ئینجا لەو خوایە دەپاڕێنەوەو دەڵێن: ئەی پەروەدگارمان ئێمەو گەلەکەمان بەراستی لەیەك جیابکەرەوە تۆ چاکترین جیاکەرەوەکانی واتە ڕاست‌و ناڕاست لەیەك جیابکەرەوە ، وەئەو وەعدەی کەداوتە بەچاکان پێمان بدەو ئەوهەڕەشەیەش کە کردوتە لە خراپەکاران بیهێنەدی هەر تۆ دەتوانی ئەمەبکەیت.

وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ أَفَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا بَيَاتًا وَهُمْ نَائِمُونَ ﴿٩٧﴾ أَوَأَمِنَ أَهْلُ الْقُرَىٰ أَن يَأْتِيَهُم بَأْسُنَا ضُحًى وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٩٨﴾ أَفَأَمِنُوا مَكْرَ اللَّهِ ۚ فَلَا يَأْمَنُ مَكْرَ اللَّهِ إِلَّا الْقَوْمُ الْخَاسِرُونَ ﴿٩٩﴾ أَوَلَمْ يَهْدِ لِلَّذِينَ يَرِثُونَ الْأَرْضَ مِن بَعْدِ أَهْلِهَا أَن لَّوْ نَشَاءُ أَصَبْنَاهُم بِذُنُوبِهِمْ ۚ وَنَطْبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَسْمَعُونَ ﴿١٠٠﴾ تِلْكَ الْقُرَىٰ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَائِهَا ۚ وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَمَا كَانُوا لِيُؤْمِنُوا بِمَا كَذَّبُوا مِن قَبْلُ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ اللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ الْكَافِرِينَ ﴿١٠١﴾ وَمَا وَجَدْنَا لِأَكْثَرِهِم مِّنْ عَهْدٍ ۖ وَإِن وَجَدْنَا أَكْثَرَهُمْ لَفَاسِقِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ بَعَثْنَا مِن بَعْدِهِم مُّوسَىٰ بِآيَاتِنَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ وَمَلَئِهِ فَظَلَمُوا بِهَا ۖ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُفْسِدِينَ ﴿١٠٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَا فِرْعَوْنُ إِنِّي رَسُولٌ مِّن رَّبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٤﴾

بۆزانین: چوار پێغەمبەر لە عەرەب بوون (هود، سالح، شوعەیب، پێغەمبەرمان) سەلامو سەلاتی خوا لەسەر هەموویان خۆ شوعەیب ئەوەندە رەوان بێژ بووە بە(وتار بێژی پێغەمبەران) نابراوە، ئەو گەلەی ئەو خەڵکی مەدیەن بوون کەشارێکە لەشارەکانی کەنعان لەدەورو بەری شام بەرەو حیجاز، جا ئەو گەلەیش بەناو ئەو شارەوە ناسراوە ئەمانە کافربوونو ڕێگایان دەگرتو خەڵکیان دەترساندو باجیان وەردەگرتو دەرختێکیان دەپەرست بەناو ﴿ئەیکە﴾ وچواردەوری دارستانێکی زۆر چڕو پڕبوە ئەویش بانگی ئەو گەلەی کرد تا تەنها خوا بپەرستنو واز لەو ئیشە خراپانە بهێنن

﴿٩٠﴾ لە وەلامیدا پیاوی دیاریو ماقوڵی گەلەکەی کە بێ باوەڕبوون وتیان: بەڕاستی ئەگەر ئێوە پەیڕەوی شوعەیب بکەن دڵنیابن کە لەدۆڕاو ورەنجەڕۆیانن.

﴿٩١﴾ ئەوسا یەك دەنگی توند ئەوانی گرتو هەموویان لەناو خانوی خۆیاندا کەوتنو مردن.

﴿٩٢﴾ ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕبون بەشوعەیب وایان بەسەرهات وەك ئەوەی هەرگیز ئەوان لەو شوێنەدا نەبوون، ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕبوون بە شوعەیب بەڕاستی هەر ئەوان زیانیان کردو لەناو چون شوعەیبو پەیڕەوانی ڕزگار بوون.

﴿٩٣﴾ جا پشتی تێکردنو وتی: ئەی گەلی من بەڕاستی من پەیامەکانی پەروەردگارم ڕاگەیاند بە ئێوە و ئامۆژگاریم کردنو بەگوێی منتان نەکرد تا توشی ئەو سزایە بون، دیارە ناڕەحەت بو بۆ گەلەکەی ، ئینجا هات دڵخۆشی خۆی کردو فەرموی: ئیتر من بۆ دەبێ خۆم ئازیەتبارکەم لەسەر گەلی بێ باوەڕ؟ ئینجا ﷲ بەسەرهاتی گەلانی پێشومان بەشێوەیەکی کورت بۆ باس دەکات ودەفەرموێ:

﴿٩٤﴾ ئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە بۆ هیچ گوندو عەشیرەتێك مەگەر خەڵکی ئەو شوێنەمان دوچاری نەخۆشیو هەژاریو کەم دەستیو زیانمان کردبێ بەڵکو ئەوان بەشێوەیەکی شەرمەندەیو گەردن کەچیەوە بگەڕێنەوە بۆلای ئێمەو داوای لێ بوردن بکەن لێمان جا کاتێ ئاوا پاڕونەتەوە ئێمە نزاکانمان لێ وەرگرتون.

﴿٩٥﴾ لەپاشا گۆڕیومانە بۆیانو نەخۆشیو تەنگ دەستیو قاتو قڕیمان لەسەر لابردووونوەوەندە نیعمەتی خۆمان ڕژاندوە بەسەریاندا تا لەهەمو بارێکەوە شتیان لەخۆیان زیاتربوە، جا لەباتی ئەوەی کە سوپاسی خوا بکەن دەیان وت: ئەمە شتێکی عادیەو بابو باپیرانمان دوچاری ئەو بەڵاو ناڕەحەتیانەبوونو لە پاشا وەزعیان چاك بووەتەوە واتە هیچ پەندو ئامۆژگارییەکیان وەرنەدەگرت بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوسا ئێمەش لەناکاو بەبێ ئەوەی کە ئەوان هەست بکەن تۆڵەمان لێ سەندن. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٩٦﴾ ئەگەر ئەهلی شارەکان باوەڕیان بهێنایەو لەئیشی خراپ خۆیان بپارستایە بەڕاستی دەرگای فەڕوبەرکەتی فروانمان بۆ دەکردنەوە لە ئاسمانو لە زەویەوە ، بەرکەتی ئاسمان وەکو بارانی زۆرو دەوام دار بەشێوەیەك کەهەمیشە لەکاتی پێویستدا بباریێت، وبەرەکەتی زەویش ئەو هەمو شتەیی لەسەریەتی هەر لە سەرچاوەو ڕوبارەوە تا میوەو سەوزەواتو دانەوێڵەو گژو گیا بۆ سود وەرگرتنی مرۆڤو مەڕو ماڵات، واتە: گەڕانەوەی ڕاستەقینەی خەڵك بۆلای پەروەردگاریو بەگوێکردنی نەك هەر پاداشتی ڕۆژی دواییان هەیە بەڵکو لە دنیایشدا هەربەخۆشیو هەرزانی دەژین ، وە بەخواپەرستی ڕاستەقینە هەردوو ژیان دەست دەکەوێت ، بەڵام زۆربەی خەڵك لە ڕێگای ڕاست لادەدات وەك دەفەرموێ: بەڵام ئەوان بێ باوەڕبون بەئایینەکەی خواو ئێمەش تۆڵە مان لێ وەگرتنەوە بەهۆی ئەو کەسابەتە ناشیرینە کە کردیان. ئینجا خوا دەمان ترسێنێ لە هاتنی سزای لەناکاوو دەفەرموێ:

(٩٧) ئایا خەڵکی ئەوشوێنانە ناترسن لەوەی کە سزای ئێمەیان بۆ بێت لەشەودا لەو کاتەی کە لەگەرمەی خەودان؟ ئایا ناترسن کەئەو خەوتنە ببێ بە خەوتنێکی هەمیشەیی‌و بمرن؟ حەسەنی بەسری دەڵێ: باوەڕدار هەمیشە خەریکی بەندایەتیەو ئەمین نیەو دەترسێت لە تۆڵەی خوا ، بەڵام مرۆڤی تاوانبار هەمیشە خەریکی تاوانەو باکی لە تۆڵەو سزای خوا نیە؟! ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٩٨) یان ئایا ئەوان ناترسن لەوەی کە سزای ئێمەیان بۆ بێت لە کاتی چێشتنگاودا و ئەوان خەریکی گاڵتەو گەمەبن؟

(٩٩) ئایا ئەوان ناترسن لە مەکری خواو دەزانن کەی خوای گەورە سزا دەنێرێ و چ بڕیارێك دەدات بۆیان؟ هیچ کەس ئەمین نابێت لەمەکری خوا مەگەر ئەو گەلەی کە زیان لێکەوت‌و خەسارەتمەند بن. کەوابو پێویستە موسڵمانان هەمیشە لە خوای خۆیان بترسن‌و لەمەکری خوا ئەمین نەبن بەراستی ئەوەی کە چاکتر خوای ناسیوە ئەوە لەهەمو کەس زیاتر عیبادەتی خوای خۆی کردوەو زیاتر لێی ترساوە ، چونکە ئەو دەزانێ کە خوا نیازی بەبەندایەتی ئەونیە ، بەڵکو بەندایەتی ئەوبۆ سودی خۆی و دەوڵەمەندبونی ئایندەی خۆیەتی‌و کێ بەرکێ کردنە بۆ بەدەست هێنانی پلە بەرزەکانی بەهەشت‌و وەرگرتنی خەڵاتی پەروەردگاری.

(١٠٠) ئایا ئاشکراو ڕون نەبوەتەوە بۆ ئەوکەسانەی کەلە پاش خەڵکی فەوتاوی تر هاتوون کە وریابن‌و تاوان نەکەن‌و بەشوێن پێی ئەوان دا نەڕۆن چونکە ئەگەر ئێمە ئارەزۆ بکەین بەهۆی گوناهەکانیانەوە هەروەك گەلانی پێش خۆیان دوچاری سزایان دەکەین‌و دڵیان مۆردەکەین جا ئیتر ئەوان هیچ ڕاستیەك نابیسن، ئاشکرایشە کە ئەگەر حەقیان نەبیست ئیتر هەرگیز ناگەڕێنەوە سەر ڕێبازی بەختەوەری‌و هەروا بەگومڕاهی دەمرن.

(١٠١) ئا ئەوانەی کەباسکران هەمو ئەو وڵات‌و شارانەبون کەوا ئێمە بەسەر هاتەکانیانت بۆ باس دەکەین‌و پێغەمبەرانیان بەنیشانەی ئاشکرا هاتنە لایان جا ئەوان باوەڕیان نەهێنا بەوەی کە گەلانی پێش خۆیان باوەڕیان پێ نەکردبو هەر ئاوەها ﷲ مۆر دەنێت بەسەر دڵی کافراندا. پێویستە ئەوەش بزانین کە ﷲ هەرگیز ستەم لە هیچ کەس ناکات بەڵکوئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیانکردوە، ئەوەتە دەفەرموێ:

(١٠٢) نابینین کە زۆربەی ئەوان عەهدو پەیمانیان هەبێت ، وە بەراستی زۆربەی ئەوانمان بەفاسق‌و پەیمان شکێن دی.

(١٠٣) لەپاش ئەم پێغەمبەرانە موسامان بە نیشانەکانمانەوە نارد بۆلای فیرعەون‌و ئەشراف‌و دەورو بەرەکانی ئەوسا ئەوان دژایەتی نیشانەکانیان کرد جا تەماشابکەن‌و بزانن چۆن بو دواڕۆژی ئەوانەی کە خراپەکارو گەنەکێڵ بون‌و چییان بەسەردا هات؟ واتە لەوانەوە پەندو ئامۆژگاری وەرگرن بائێوەیش ئاواتان بەسەرنەیەت .

(١٠٤) موسا وتی: ئەی فیرعەون بەراستی من ڕەوانە کراوم لەلایەن پەروەردگاری عالەمەوە، لە سورەتی بەقرەدا بەهۆی باسی جولەکەوە کەمێ باسی موسا کرا لێرەدا کورتە بەسەرهاتێکی دەنوسین بۆئەوەی لێرەو لەداهاتودا ئاسان تر لەمانای وشەکان تێ بگەین موسا ﵇ هەرلە سکی دایکیابو جادوو گەران نزیك بونەوەی لە دایکبونی کەسێکیان بە فیرعەون ڕاگەیاند ، کەلە ئایندەدا دەبێت بەهۆی لەناوچونی هێزو دەسەڵاتی تۆ هەرلەبەر ئەوە فیرعەون فەرمانی دا کە ژنانی بارداری بەنی ئیسرائیلی چاودێری بکرێن‌و هەرچی نێرینەیان بو سەری ببڕن ، خوا دایکی موسای وا لێکرد کە ئەو ئافرەتە پشکێنەرەی هەستی بەبارداری نەکردو کاتێ بو خوا وای تێگەیاند کە منداڵەکەی بخاتە ناو سندوقێکەوەو بیبات بەرەو ڕوباری نیل، دایکی موسایش ئەو کارەی ئەنجام داو منداڵ بەسندوقەوە برایە لای ماڵی فیرعەون چونکە پیاوانی فیرعەون ئەو سندوقەیان لەناو ئاودا دەرهێنا ، کاتێ کە خێزانی فیرعەون کردیەوە هەستی بەروناکیەك کردو داوای لە فیرعەون کرد کە نەی کوژن بەڵکو هەڵی بگرن‌و بەخێوی بکەن‌و بیکەن بەکوڕی خۆیان چونکە فیرعەون کوڕی نەبوە ، بەوشێوەیە کەوتە ماڵی فیرعەونەوە ، جا چونکە خوا مەمکەی هەمو ئافرەتێکی لێ قەدەغە کرابو بە قسەی خوشکی کەبەفەرمانی دایکی بەنهێنی بەدوایدا چوبو بەدایەن دایانەوە لای دایکی کە گوایە ئەوە ئافرەتێکەو هەمو منالێك مەمکی دەگرێت نەك بەناو دایکییەوە کەلە سورەتی (طه)دا باسکراوە چونکە ئەگەر بزانرایە کە کوڕی ئەوە دەیان کوشت ، بەم شێوەیەﷲ گەڕاندییەوە لای دایکی‌و خزمەتیشیان دەکرد لەسەر بەخێوکردنەکەی!! موسا گەورە بو لەناو قیبتیەکانداو وەك کوڕی فیرعەون حیسابیان دەکردو لەناو بەنی ئیسرائیلیەکانیشدا ، چونکە شیردەرەکەی لەوان بو بەبەنی ئیسرائیلیان دادەنا واتە لای هەردوو لایان ڕێزی تایبەتی هەبو تا ڕۆژێك قەدەری خوا وابوروی کردە شار کاتی بێ ئاگایی خەڵکەکەی‌و لەوێ چاوی بەدووپیاو کەوت یەکێکی بەنی ئیسرائیلی‌و یەکێکی قیبتی کە شەڕیان بو بەنی ئیسرائیلیەکە وتی: موسا فریام کەوە موسا هات‌و گورمشتێکی لەکابرای قیبتی داو کابرا مرد موسا لەو

حَقِيقٌ عَلَىٰٓ أَن لَّآ أَقُولَ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ قَدۡ جِئۡتُكُم بِبَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَرۡسِلۡ مَعِيَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٠٥﴾ قَالَ إِن كُنتَ جِئۡتَ بِـَٔايَةٖ فَأۡتِ بِهَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٠٦﴾ فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ ﴿١٠٧﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٠٨﴾ قَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ عَلِيمٞ ﴿١٠٩﴾ يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُمۡۖ فَمَاذَا تَأۡمُرُونَ ﴿١١٠﴾ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَأَرۡسِلۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿١١١﴾ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ﴿١١٢﴾ وَجَآءَ ٱلسَّحَرَةُ فِرۡعَوۡنَ قَالُوٓاْ إِنَّ لَنَا لَأَجۡرًا إِن كُنَّا نَحۡنُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٣﴾ قَالَ نَعَمۡ وَإِنَّكُمۡ لَمِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿١١٤﴾ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ نَحۡنُ ٱلۡمُلۡقِينَ ﴿١١٥﴾ قَالَ أَلۡقُواْۖ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ سَحَرُوٓاْ أَعۡيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسۡتَرۡهَبُوهُمۡ وَجَآءُو بِسِحۡرٍ عَظِيمٖ ﴿١١٦﴾ ۞ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۖ فَإِذَا هِيَ تَلۡقَفُ مَا يَأۡفِكُونَ ﴿١١٧﴾ فَوَقَعَ ٱلۡحَقُّ وَبَطَلَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٨﴾ فَغُلِبُواْ هُنَالِكَ وَٱنقَلَبُواْ صَٰغِرِينَ ﴿١١٩﴾ وَأُلۡقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿١٢٠﴾

ئیشەی خۆی دڵتەنگ بو داوای لێ بوردنی لە خوا کردو کەس پێی نەزانیو قیبتیەکان زۆر دەگەڕان تا بەڵکو بکوژی کابرا بدۆزنەوە تا ڕۆژێکی تر هەمان کابرای بەنی ئیسرائیلی لەگەڵ یەکێکی تری قیبتیدا شەڕی کردو موسای دیو هاواری بۆ هێنا موسایش پێشەکی لەو توڕەبوو وتی: تۆ پیاوێکی چاك نیت هەمیشە خەریکی شەڕو هەرادروستکردنیو پەلاماری کابرای قیبتی دا بەڵام کابرای بەنی ئیسرائیلی وای زانی موسا بۆئەو پەلەمار دەبات ئەوەبو گورج هاواری لێ هەڵساو وتی: ئەی موسا تۆ دوێنێ زەلامێکت کوشتو ئەمڕۆیش بەتەمای من بکوژیت؟ بەڵێ، قسە کەوتە زارو ڤاڵ کەوتە شارو بە گوێی فیرعەونیان گەیاند فیرعەونیش بڕیاری کوشتنی دا بەڵام کەسێك کەخوا نەیکوژێت کێ دەتوانێ بیکوژێت؟ کابرایەك بەپەلە هاتو هەواڵەکەی بەموسا گەیاندو وتی: راکە ئەگینا ئەتکوژن ئینجا موسا رای کردو ڕۆیشت تا گەیشتە مەدیەنو لەوێ لەسەر بیری ئاوێك چاوی بە چەند شوانی مەڕو ماڵات کەوت کە ئاویان بەوەمەڕوماڵاتە دەدا بەڵام لە دوری ئەوانەوە دوو ئافرەتی دی کە کۆمەڵە حەیوانێکیان پێ بو لێیان نزیك کەوتەوەو پرسیاری لێ کردن بۆچی ئێوە لێرەدا وەستاون؟ وتیان: ئێمە ئافرەتینو باوکمان پیرەو توانای ئاودانی حەیوانی نیەو ئێمەش نامانەوێ تێکەڵاوی ئەو پیاوە شوانانە ببین لێرەدا دەوەستین تائەوان لێ دەبنەوە ئینجا ئێمە حەیوانی خۆمان ئاودەدەین . موسا هاتو حەیوانەکانی ئەوانی بردو ئاوی دانو بۆی هێنانەوەو ئەوانیش گەڕانەوە بۆ ماڵو موسایش لە برسا هاواری لە خوای خۆی کرد کە شتێکی بۆ بگەیەنێت، ئاشکرایە کە ئەمانیش لەعادەتی خۆیان زووتر گەڕاونەتەوەو بوەتە هۆی پرسیارکردنی باوکییان لێیان کە چۆن بو وا ئەمڕۆ زوو هاتونەتەوە؟ ئەوانیش داستانەکەیان بۆ باسکرد جا باوکیان یەکێ لە کچەکانی نارد بە شوێنیاو دەعوەتی کرد تا حەقی ئاودانەکەی پێ بدات ، ئینجا کاتێ موسا هاتو دەنگو باسی خۆی بۆ گێڕایەوە کابرا وتی: مەترسە ڕزگاربویت لەگەڵی ستەمکار، ئینجا یەکێ لەکچەکان وتی: ئەی باوکی خۆشەویستم بەکرێی بگرە بەڕاستی چاکترینی کەسانێکە کە تۆ بەکرێت گرتبنو بەهێزو دەمو دەست پاکە، بۆیە پیاوەکە پێی وت: من ئەمەوێ یەکێك لەم کچانەت لێ نیکاح بکەم بەوەمەرجەی هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکەیت ، وەئەگەر بیکەیت بەدەساڵ ئەوە پیاوەتی خۆتەو من نامەوێ سەختگیریت لێ بکەم ، موسایش وتی: باشە کامیانم بۆ جێ بەجێ کرا پەسەندی بکەیتودەستدرێژی نەکەیتەسەرم، بەڵێ، موسا شوانی خۆی تەواو کردو دالغەی وڵاتی خۆی هات بەسەریداوبەرەو وڵاتی خۆی کەوتە رێو شەو لەلای کێوی تور چاوی بە تروسکەی ئاگرێك کەوتو بەخێزانەکەی وت: لێرە بوەستن من چاوم بەئاگرێك کەوت تا بچمەلای بەڵکو هەواڵێك بزانم یان دەستەوارەیەك ئاگر بێنم تا خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە ، موسا ڕۆیشتو لەو شوێنەدا نیگای(الوحی) خوای بۆهاتو دوو بەڵگەی گرنگی پێدرا یەکێك عەساکەی بو کە دەبو بەمار . دووهەم: دەستی ڕاستی کەدەیکرد بەباخەڵیاو دەری دەهێنایەوە زۆر سپی دەبو . جا فەرموی: بچۆ بۆلای فیرعەونو دەستو دایرەکەی کە ئەوان گەلێکی فاسقن، موسایش وتی: ئەی پەروەردگارم من لە ترسی فیرعەون ڕام کردوەچونکە زەلامێکم لێ کوشتوون دەترسم بمکوژن ، وە چەند داخوازیەکی تری لە خوا کردو خوایش داخوازییەکانی لێ وەرگرتو هارونی برایشی کرد بەپێغەمبەرو هەردوو کیان چونەلای فیرعەون. جا ئیتر فەرمون بالەگەڵ ئایەتەکانی ئەم سورەتەدا بینو بزانین چی کراوە، خوا دەفەرموێ: موسا وتی:

﴿١٠٥﴾ شایستەو لایق هەرئەوەیەکەمن جگە لەراستی لەلایەن (الله) وە هیچ شتێکی ترنەڵێمو ئەمەش قسەمە کە دەڵێم: من بە نیشانەی ئاشکرا لەلایەنی خوای خۆتانەوە هاتومەتە لاتان دەی جا وازلە بەنی ئیسرائیل بهێنە بالەگەڵ مندا بنو ئازاریان مەدەو چیتر مەیان چەوسێنەوە.

﴿١٠٦﴾ فیرعەون وتی: باشە تۆ ئەگەر بە بەڵگەو نیشانەیەك هاتویت بۆسەلماندنی قسەکەت دەی بیهێنە ئەگەر تۆ لە ڕاست گۆیانی.

(١٠٧) موسا عەساکەی خۆی فڕێ داو بو بەیەك ئەژدیهای گەورەو زل دەمی کردەوەو پەلاماری فیرعەونی داو فیرعەونیش لە ترسا رای کردو داوای لە موسا کرد کە بیگرێتەوە موسا گرتی هەر عەساکەی خۆی بو.

(١٠٨) دەستی خۆی دەرهێنا کەچی ئەویش سپیو ئەدرەوشایەوە وەك مانگ بەبێ ئەوەی لەکەیەکی ناشیرین دروست بکات.

(١٠٩) جا ئەوانەی کە دەمراسو پیاوماقوڵانی گەلی فیرعەون بون وتیان: بەراستی ئەمە ساحیرێکی زۆر زانایە. بەڵێ ، هەمیشە کاسەلێسانی هەمو سەردەمێك هەر ئاوەها بون کاتێك کەلەگەڵ ستەمکاراندا قسەدەکرێتو کەمێك نەرم ئەبن لەوکاتەدا دەستو پێ کانیان بۆ خۆنواندنو خۆ بە پیاو چاك نیشاندان لەلای ئەو ستەمکارانە دەست دەکەن بە خۆ هەڵکێشانو زیاتر کابرای ستەمکار سوردەکەن لەسەر دژایەتی ئایینو ئەخلاقو رەوشتو موسڵمانان بەڵام کاتێ کەقیامەت هات جا ئەوکاتە ستەمکارو ژێردەستە هەردوو نەفرینی یەکتر دەکەن ، جا کاتێ کاسەلێسانی دەربار وایان وت فیرعەون وتی:

(١١٠) دەیەوێت دەرتان بکات لەناو زەوی وزاری خۆتاندا جا ئیتر بڕیاری ئێوە چییە؟ بەڵێ، تا ئێستا هەرخۆی فەرماندەبو بەڵام وائێستا ترسی واقیعی پەیدا بوو کورسییەکەی کەوتەلەرزین ، جا بەوان دەڵێ چی ئەمردەکەن؟!

(١١١) وتیان: رایگرە خۆی وبراکەشی کە هارونەو مەئمورانی کۆکەرەوە رەوانەبکە بۆ شارەکان تا خەڵك کۆکەنەوە.

(١١٢) تا هەرچی ساحیری زۆر زانا هەیە هەموویان کۆ بکەنەوەو بۆت بهێنن، ئەمانە وایان دەزانی موسا ساحیرەو دەیان ویست بەسیحر بەرپەرچی بدەنەوە دیارە ئەویش بە گوێی کردنو پیاوی ناردو ساحیران کۆکرانەوە .

(١١٣) جا ئەو ساحیرانە هاتن بۆلای فیرعەونو وتیان: ئایا ئێمە پاداشتمان هەیە ئەگەر هاتو سەرکەوتین بەسەر موسادا؟

(١١٤) فیرعەون وتی: بەڵێ، ئێوە ئەبنە پیاو نزیکانی خۆم. ئینجا موسایش کاتێ کە ئەوانی دی وەك لە سورەتی (طه_٦١_) دا هاتوە ئامۆژگاری کردنو وتی: (وای بۆ ئێوە درۆ دروست مەکەن بەدژی ألله بەهاوڵ دانان بۆی بەراستی خوا بەسزا لەناوتان دەبات، وەبەراستی رەنجەڕۆبووە ئەوکەسەی کە درۆی هەڵبەست) ئەگەرچی زۆربەیان بەم قسەیە کەوتنە گومانو ترسەوە لە ئیشەکەی خۆیان بەڵام هەندێکیان کەدەستو پلەو پایەی لای فیرعەونیان هەبو ساحیرەکانی تریان هەڵناو وایان لێ کردن کەلە بەرامبەری موساوە بووەستن ئەوەتە ،

(١١٥) وتیان: ئەی موسا یا تۆ ئیشی خۆت بکەو عەساکەت فڕێبدە یان ئێمە ئیشی خۆمان دەکەینو عەساو گوریسی خۆمان فڕێ دەدەین

(١١٦) موسا وتی: ئێوە ئیشی خۆتان بکەن تا خەڵکی ببینێ. دەڵێن دە ، یان (پانزە ، یان سی ، یان حەفتا) هەزار جادوگەر بوونو هەریەکەیان گوریسێكو عەسایەکیان پێ بووەو کاتێ کە فڕەیان داوو ئیشی خۆیانیان کرد کاریان کرد لە چاوی ئەو هەمو خەڵکە بەتایبەت لە چاوی فیرعەون لەچاوی موسا ﷺ پێیان وابو کەئەمانە شتانێکی راستنو مارو ئەژدیهان تەنانەت موسا ترسا کە ئەو شتە گرنگانەی دیو سیحرەکەیان کاری کردبوە سەر چاوی بۆیە خوا فەرموی: ﴿لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ٦٨﴾ طه: ٦٨ مەترسە بەراستی ئەمڕۆ هەرتۆ سەرکەوتودەبیت) پێغەمبەران (علیهم السلام) هەمیشە لە خوا ترساون ئەگەر لەوکاتەدا خوا وەڵامیان نەداتەوە موسا چی دەکرد؟ بەڵێ، هەمو خەڵکیان ترساندو سیحرێکی زۆر گەورەیان کرد ئەوەبو ئەو ژمارە زۆرە هەریەکە گوریسی خۆیو عەسای خۆی فڕەداو بون بەئەژدیهای زۆر گەورەو دەجوڵانو دەهاتن بەسەریەکدا لەبەر چاوی خەڵك لە ناو ئەو شیوەدا، جا وا ئەوان ئەوەی لەتوانایان دابو کردیانو سرنجی خەڵکیان بۆ خۆیان راکێشاو موسایش تەماشا دەکات ، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١١٧) خۆ لەو کاتەدا ئێمەش وەحیمان کردە لای موساو وتمان عەساکەت فڕێ بدە . بەڵێ، موسایش فەرمانی خوای خۆی ئەنجام داو عەساکەی فڕێ دا دەسوەدەم ئەو عەسایە کەئەیدا بەلای هەرکامیاندا هەڵی دەلوشی، ساحیرەکان زانیان کەئەمە ئیشی سەرزەوی نیەو زانیان کەلەلایەن خواوەیە

(١١٨) جا حەق جێگیر بو ، وە ئەوەی کەئەوان کردبوویان هەموی هەڵوەشایەوە.

(١١٩) ئیتر ئەو ساحیرانە لەوێدا شکستیان خوارد وهەموویان زەلیلو سەرشۆڕبون لەبەرانبەر راستیداو خۆیان لێ بێزراو ئیشەکەی خۆیانیان لاناشیرین بوو هەربۆیە بەپەلە،

(١٢٠) جادوگەرەکان هەموویان سوجدەیان برد بۆ خوا بەهۆی ئەو ئیشە گرنگەی موساوەو دانیان بەراستی موسادا نا،

(١٢١) وتیان: ئێمە باوەڕمان هێنا بەپەروەردگاری جیهان.

قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢١﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٢﴾ قَالَ فِرۡعَوۡنُ ءَامَنتُم بِهِۦ قَبۡلَ أَنۡ ءَاذَنَ لَكُمۡۖ إِنَّ هَٰذَا لَمَكۡرٞ مَّكَرۡتُمُوهُ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لِتُخۡرِجُواْ مِنۡهَآ أَهۡلَهَاۖ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿١٢٣﴾ لَأُقَطِّعَنَّ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَرۡجُلَكُم مِّنۡ خِلَٰفٖ ثُمَّ لَأُصَلِّبَنَّكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿١٢٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿١٢٥﴾ وَمَا تَنقِمُ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ ءَامَنَّا بِـَٔايَٰتِ رَبِّنَا لَمَّا جَآءَتۡنَاۚ رَبَّنَآ أَفۡرِغۡ عَلَيۡنَا صَبۡرٗا وَتَوَفَّنَا مُسۡلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلَأُ مِن قَوۡمِ فِرۡعَوۡنَ أَتَذَرُ مُوسَىٰ وَقَوۡمَهُۥ لِيُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَيَذَرَكَ وَءَالِهَتَكَۚ قَالَ سَنُقَتِّلُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَنَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡ وَإِنَّا فَوۡقَهُمۡ قَٰهِرُونَ ﴿١٢٧﴾ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱللَّهِ وَٱصۡبِرُوٓاْۖ إِنَّ ٱلۡأَرۡضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾ قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٢٩﴾ وَلَقَدۡ أَخَذۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾

﴿١٢٢﴾ که پەروەردگاری موساو هارونە. بەڵێ، ئەو هەمو ساحیرانە باوەڕیان هێنا جا ئینجا کاسەلێسان چی بکەن؟ کەوتنە هەڵنانی فیرعەون تا تەسلیم نەبێو ئەمانیش پلەو پایەکانیان لەدەست نەچێت، ئەوەندەیان وت: تا ،

﴿١٢٣﴾ فیرعەون وتی: باوەڕتان هێناوە بەموسا بەرلەوەی کە من ئیزنتان پێبدەم؟ چۆن ئیشی وادەکەن دەبوایە ئێوە ئیزن لەمن بخوازن بۆ باوەڕهێنانو نابێ هەروا خود سەرانە بڕیاربدەن؟! ئەمە فڕوفێڵێکە کە ئێوە لەم شارەدا ئەوفڕوفێڵەتان کردووەوکەینو بەینێ بوەلەنێوان ئێوەوموسادا کە باوەڕتان بە موسا هێناوەو دەتانەوێ خەڵکەکەی دەربکەن؟ جا فیرعەون هەرچەند دەیزانی کە قسەکەی راست نیە بەڵام بۆ خەڵەتاندنی گەلە نەفامو نەزانەکەی ئاوای بەو ساحیرانە دەوتو هەڕەشەی لێ کردنو وتی: لەمەودوا دەزانن کە چیتان بەسەر دەهێنم سوێندی دەخواردو دەیوت:

﴿١٢٤﴾ بەراستی دەستەکانتانو پێکانتان بەپێچەوانەوە دەبڕمەوەو چەپو راستان پێ دەکەم لەپاشان بەدارخورمادا هەموتان هەڵدەوەستم، بەڵام ساحیرەکان گوێیان نەدایە هەڕەشەکەی بەڵکو

﴿١٢٥﴾ وتیان: ئێمە بۆلای خوای خۆمان دەگەڕێینەوە. وەکو لە سورەتی (طه/٧٢) دا وتیان: (هەرچی دەکەیت بیکە ئیشی تۆ هەرلەدنیادا دەبێ )

﴿١٢٦﴾ تۆ رقت نیە لە ئێمە مەگەر لەبەر ئەوەیە کە ئێمە باوەڕمان هێناوە بەو ئایەتانەی خوای خۆمان کە هاتوەتەلامانو دەزانین کەراستن، ئەگینا خۆ ئێمە هیچمان لە تۆ نەکردوە نەماڵمان خواردویتو نە دەست درێژیمان کردوەتەسەرتو نەشۆڕشێکمان لێکردویت، ئاشکرایە ستەمکاران کەکورسیان کەوتە مەترسییەوە نەسۆزیان هەیەو نەبیر لە قسەی راستو دروست دەکەنەوە بەڵکو دەیانەوێ هەرچی بەکەیفی ئەوانە ، هەر ئەوەببێت بۆیە باوەڕدارانیش زانیان کەقسەی خۆی دەباتە سەرو دەستدرێژی دەکاتە سەریانو وتیان: خوایە سەبرمان زیاد بکە کەبتوانین خۆمان بگرین بەرامبەر بەو ناڕەحەتیانەی کە توشمان دێتو خوایە بەموسڵمانی بمان کوژەو کارێك نەبێ کە ئێمە لەم ئاینە پەشیمان ببینەوەو بەکافری بمرین، بەراستی جێگای بیرکردنەوەیە ئەوانەی کەدووسێ سەعات لەمەوپێش مەبەستی هەرە گرنگیان تەنها نزیکی فیرعەون بو، وە لەهەموشت بەچاکتریان دەزانی وائێستا نەك فیرعەون بەڵکو داوای ژیانی دنیایش ناکەن بەڵکو دەیانەوێ بمرن لەسەر ئەو بیرو باوەڕە!!

﴿١٢٧﴾ئینجا دەوروبەرەکانی فیرعەون دەستیان کرد بەهەڵنانی فیرعەون بۆلەناوبردنی موساو پەیڕەوانیو وتیان: ئایا تۆ وازدێنیت لەموساو گەلەکەی تا ئەوان خراپەو فەساد بکەن لە م وڵاتەدا ؟! واتە ئەوان بونی موساو بەرنامەکەی بەفەساد دەزاننو خۆیان بە پیاو چاك حیساب دەکەن !! وتیان: وازیان لێ دەهێنی لەگەڵ ئەوەشدا کەبەندایەتیت نەکەن؟ واتە شتی وانەکەیتو ماوەیان پێ نەدەیت، فیرعەونیش فوی کردە خۆیو وتی: خەم مەخۆن لەمەودوا کوڕەکانیان دەکوژینو ژنەکانیان دەهێڵینەوە هەم لاوازیان دەکەینو هەم سود لە ئافرەتەکانیان وەردەگرین، وە ئێمە بەسەر ئەواندا زاڵین ئەمە دوجارە فیرعەون ئەم جۆرە رەفتارە بکات لەگەل بەنی ئیسرائیلدا پێش لەدایکبونی موساو ئێستایش، جا دیارە هەواڵی ئەم بڕیارەی فیرعەون گەیشتە موسا ﷷ ئاشکرایە کەئەوانیش ترسیان دەبێت لە فیرعەون چونکە ئەو خاوەنی هێزو دەسەڵاتێکی زۆر بو،

﴿١٢٨﴾ بۆیە موسایش دڵنەوایی گەلەکەی کردوپێی وتن: داوای یارمەتی لەخوابکەنو خۆتان بگرن بێگومان ئەم زەویە موڵکی خوایەو دەیدات بەهەرکەسێك کە خۆی ئارەزۆی لێبێت لە بەندەکانی، رۆژێ دەیداتە دەست فیرعەونێك لەفیرعەونەکانو رۆژێکی تر دەیداتە دەستی پیاوچاکێك لەپیاوچاکان چونکە موڵکی خۆیەتیو چۆن ئارەزۆی لێ بێ وای لێ دەکات بەڵام سەرئەنجامو سەرکەوتن بۆ پەرهیزکارانە، جا کێ راستی کرد لەگەڵ خوادا هەر ئەو دەیباتەوە ، لەراستی دا ئەوەگرنگ نیە

فَإِذَا جَآءَتۡهُمُ ٱلۡحَسَنَةُ قَالُواْ لَنَا هَٰذِهِۦۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَطَّيَّرُواْ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓۗ أَلَآ إِنَّمَا طَٰٓئِرُهُمۡ عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُواْ مَهۡمَا تَأۡتِنَا بِهِۦ مِنۡ ءَايَةٖ لِّتَسۡحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلۡجَرَادَ وَٱلۡقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٖ مُّفَصَّلَٰتٖ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيۡهِمُ ٱلرِّجۡزُ قَالُواْ يَٰمُوسَى ٱدۡعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَۖ لَئِن كَشَفۡتَ عَنَّا ٱلرِّجۡزَ لَنُؤۡمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرۡسِلَنَّ مَعَكَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُمُ ٱلرِّجۡزَ إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمۡ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٣٦﴾ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ﴿١٣٧﴾

کەکابرایەك چەند ساڵ فەرمانڕەوایی دەکات چونکە هەر دەبێ بمرێ وشوێنی خۆی چۆڵ بکات گرنگ ئەوەیە لەپاش مەرگ چی بەسەردێ کە هەرگیز نابڕێتەوە، جائەگەر چاکبو ئەوە هەردوو دنیایی بوە، وەئەگەر خراپ بو ئەوە هەموی لەدەست چوەو تازە رزگاری نابێت، کەوابو پەرهیزکاران بردیانەوە هەرچەند بەسەختی بژین لەم چەند رۆژەی دنیادا،

(١٢٩) ئەو گەلەی موسا وتیان: ئەی موسا بەرلەوەی تۆ بێیت هەر ئازار دەدراین‌و ئێستاش کەتۆ هاتوی هەر ئازار دەدرێین؟ جا ئیتر لە هاتنی تۆدا چ سودێکمان دەست کەوتوە؟ موسایش هەردڵنەوایی دەکردن‌و مژدەی سەرکەوتنی پێ دەدان‌و وتی: نزیکە کەپەروەردگارتان دوژمنەکەتان بفەوتێنێت‌و لەم وڵاتەدا ئێوە بکات بەجێنشینی ئەوان جا تەماشا بکات‌ودەری بخات بۆجیهانیان تابزانرێت کە ئێوە چۆن رەفتار دەکەن ، موسا بەوشێوەیە مژدەی دەدا بەگەلەکەی‌و دەیوت: سەردەکەون بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانن کە سەرکەوتنی ئێوەش بۆ تاقی کردنەوەیە، ئەگەر چاك جوڵانەوە پاداشی چاکتان دەبێ، وەئەگەر خراپیش جوڵانەوە پاداشی خراپتان پێ دەدرێتەوە، بەڵێ، موسا بانگەوازەکەی خۆی بە فیرعەون‌و گەلەکەی گەیاندو نەترسانە هەرچی پێ سپێرابو پێی راگەیاندن بەڵام فیرعەون لە ستەم‌و تاوانی خۆی پەشیمان نەبوو بەنی ئیسرائیلیشی نەدایە دەست موسا. ئینجا ﷲ بۆ ئەوەی زیاتر بیربکەنەوەو هیچ بەهانەیەکیان نەمێنێ بۆ دوا رۆژ چەندین بەڵای جۆراو جۆری دابەسەریاندا وەك دەفەرموێ:

(١٣٠) بەراستی تۆڵەمان وەرگرت لە فیرعەون بە قات‌و قڕی‌و گرانی‌و نەبارینی باران‌و کەم کردنەوەی بەروو بوم‌و میوەکان بۆ ئەوەی کە ئەوان بیر بکەنەوەو پەند وەربگرن‌و وازلە ستەمکاری‌و تاوان بهێنن.

(١٣١) جاهەرکاتێك خۆشیەك روی تێدەکردن‌و دەکەوتنە فەرەحیەوە دەیان وت: ئەمەتایبەتی خۆمانەو خۆمان شایستەی ئەوەین بۆیە خوا ئەمەمان لەگەڵدا دەکات، وەئەگەر توشی زیان‌و خراپەیەك دەبون دەیان وت: ئەمە خەتای موساو قەومەکەیەتی‌و نەگبەتی ئەوانە بۆیە ئێمە کەوتوینەتە ناو ئێش‌و ئازارو ناڕەحەتیەوە، ئینجا ﷲ دەمکوتیان دەکات‌و دەفەرموێ: پێیان بڵێ ئاگاداربن نەگبەتی ئەوان لای خوایەو ئەوان خۆیان خراپەو فەسادیان کردوە بۆیە وا دوچاری بەڵادەکرێن بەڵام زۆربەی ئەوان نازانن کە هەموشت بەدەست خوایەو پێغەمبەران تەنها گەیاندنیان لەسەرەو ناتوانن هیچ بەڵایەك بەسەر کەسدا بهێنن تەنانەت پێغەمبەران زۆر دڵسۆزی گەلەکەیان بون‌و حەزیان نەدەکرد گەلەکەیان دوچاری هیچ ناخۆشیەك ببێت‌و هەمیشە لە خوا دەپاڕانەوە کە رێنمای گەلەکەیان بکات تا رزگاربن لە تۆڵەو سزای خوا ، واتە نەزیان‌و نەسود بەدەست هیچ کەس نیە تەنها بەدەست خوایەو تا خوا ئارەزۆی لێ نەبێت هیچکامیان نابێت، هەرکەس پێی وابێ کە ئەم دووشتە لە غەیری خواوە دەبێ ئەوکەسە موشریکەو هەموو کردارە چاکەکانیان ئەگەر هەیانبێ هەڵدەوەشێتەوەو بێ تەوبە کردن لەو بۆچونە هەڵەیە خوا نایان بەخشێت. واتە،هەرخۆیەتی (النافِعُ،الضار)

بەڵێ، فیرعەون‌و گەلەکەی بەهەمو هێزەوە دژایەتی موسایان دەکرد.

(١٣٢) جا دەیان وت: ئەی موسا تۆ هەر بەڵگەیەك بۆ ئێمە بهێنیت‌و هەر نیشانەیەکمان پیشان بدەیت بۆ ئەوەی ناچارمان بکەیت بەبڕواهێنان ئەوسا ئێمە هەرگیز باوەڕت پێ ناکەین‌و پەیڕەویت ناکەین. ئینجا ﷲ چەند بەڵای گەورەی دابەسەریاندا ، وەك دەفەرموێ:

(١٣٣) لەپاش ئەوەی کە سەرکەشیان کرد تاقیمان کردنەوە بە بارانێکی زۆر کە دەباری بەسەریانداو زەوی‌و کێڵگەکانیان پڕلە ئاوببون‌و بوبن بە زۆنکاوو دەغڵ‌ودانەکانیانی لەناوبرد، وە کولەی بۆناردن کە هەرچی دانەوێڵەیان هەبو هەموی خواردوو هیچی بۆنەهێشتنەوە تەنانەت دەڵێن بزماری دەرگاکانیشی دەخوارد، خواردنی کوللە حەڵاڵە. عەبدوڵای کوڕی ئەبی ئەوفا دەڵێ: { غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ سَبْعَ غَزَوَاتٍ نَأْكُلُ الْجَرَادَ /مسلم/

وَجَٰوَزْنَا بِبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتَوْا۟ عَلَىٰ قَوْمٍ يَعْكُفُونَ عَلَىٰٓ أَصْنَامٍ لَّهُمْ ۚ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ ۚ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿١٣٨﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ مُتَبَّرٌ مَّا هُمْ فِيهِ وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٣٩﴾ قَالَ أَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْغِيكُمْ إِلَٰهًا وَهُوَ فَضَّلَكُمْ عَلَى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٠﴾ وَإِذْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ ءَالِ فِرْعَوْنَ يَسُومُونَكُمْ سُوٓءَ ٱلْعَذَابِ ۖ يُقَتِّلُونَ أَبْنَآءَكُمْ وَيَسْتَحْيُونَ نِسَآءَكُمْ ۚ وَفِى ذَٰلِكُم بَلَآءٌ مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ ﴿١٤١﴾ ۞ وَوَٰعَدْنَا مُوسَىٰ ثَلَٰثِينَ لَيْلَةً وَأَتْمَمْنَٰهَا بِعَشْرٍ فَتَمَّ مِيقَٰتُ رَبِّهِۦٓ أَرْبَعِينَ لَيْلَةً ۚ وَقَالَ مُوسَىٰ لِأَخِيهِ هَٰرُونَ ٱخْلُفْنِى فِى قَوْمِى وَأَصْلِحْ وَلَا تَتَّبِعْ سَبِيلَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾

له خزمەت پێغەمبەری خواداﷺ حەوت غەزامان کردوە کە کوللەمان دەخوارد} بەڵام پێغەمبەرمانﷺ نەیدەخوارد چونکە تەبیعەتی نەچوەتە سەری وەك بزن مژەو گورچیلەو حەرامی نەکردوون. وەئەسپێ یان گەنەی زۆری بۆ ناردن کەهەمو خۆراکیان پڕ ببو، هەندێك دەڵێن ئەمانە بەهۆی هەرزانی پێشویانەوە کەپاش پاڕانەوەی موسا خوا پێی دابون دەغڵ و دانێکی زۆریان خستە ئەنبارەوەو خۆیان بێ نیاز زانیو دەستیان دایەوە خراپەو خوا ئەوئەسپێیەی بۆ ناردن کە هەموو دەغڵو دانە ئەنبارکراوەکەی پوچەڵ کردن کەئەگەر دە تەنەکەیان لە ئاش بکردایە دوو تەنەکە ئاردیان دەست نەدەکەوتەوەهەروەها بۆقی بۆناردن ئەوەندە زۆربو کە خواردنیان دادەنا دەچوە ناویەوەو خواردنو خواردنەوەیان پڕبوو لە بۆق. وەهەروەها تاقی کرانەوە بەخوێن، ئەمانە هەموویان چەندین بەڵگەی جیاجیابونو هەریەکەی پاش ماوەیەك بۆ ئەوەی فیرعەونو گەلەکەی واز لە تاوان بهێننو پەیڕەوی موسا بکەن بەڵام ئەوان زیاتر لوت بەرزیان دەکردو دژایەتی موسایان زیاتر پەرەپێدەداو ئەوان گەلێکی تاوانباربوون.

﴿١٣٤﴾ خۆ هەرکاتێك کەئەوان دەکەوتنە نارەحەتیەوەو توشی یەکێك لەو سزایانە دەبون هاواریان دەکردو دەیان وت: ئەی موسا بانگ بکە پەروەردگارت بۆ رزگاریمان بەهۆی ئەوگفتەو پەیمانەی کە پێی داویت جا ئەگەر ئەو سزایەمان لەسەر لاببەیت بەراستی باوەڕت پێ دەکەینو بەنی ئیسرائیلیشت لەگەڵدا دەنێرین ، بەڵام خوا دەفەرموێ:

﴿١٣٥﴾ جا هەرکاتێك کە ئێمە ئەو سزایەمان لەسەر لابردونو گەیشتون بەبارودۆخێکی باش ئەوان هەرزۆر بەزوی عەهدو پەیمانی خۆیانیان دەشکاندو دەچونەوە سەر بارودۆخی پێشو کە دژایەتی موسا بو بۆیە ﷲ رقی لێ هەستانو تۆڵەی یەکجارەکی دنیایی لێ کردنەوە ، وەك دەفەرموێ:

﴿١٣٦﴾ خۆ ئێمەش تۆڵەمان لێ کردنەوە ، ئەوسا لەناو دەریادا ئەوانمان خنکاند چونکە ئەوان بێ باوەڕبون بە نیشانەکانی ئێمە و خۆیان دایە گێلیو گوێیان نەدایە بەرنامەکەی ئێمەو زۆر بێ ئاگابون لێی ، بەم شێوەیە کۆتایی بەتەمەنی فیرعەونو گەلە نەزانەکەی هاتو هەموویان لەدەریای نیل دا خنکانو موساو پەیڕەوانی رزگاریان بوو سەروەتو سامانی ئەوان کەوتە دەست موساو پەیڕەوانی وەك دەفەرموێ:

﴿١٣٧﴾ جا ئێمە ئەو گەلەی کە لاوازو بێچارە کرابون رۆژهەڵاتو رۆژئاوای ئەو وڵاتەی کە فەڕوپیتمان تێدا دانابوو پێدانو کردمانن بە خاوەنی سەروەتوسامانی فیرعەونو پەیڕەوانیو بڕیارەجوانو ڕێکوپێکەکەی پەروەردگارت بوبە خەیروبەیرو رژا بەسەر بەنی ئیسرائیلیدا ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە خۆیان گرت. واتە هۆیەکی گرنگی سەرکەوتن خۆگرتنەو هەر خاوەن باوەڕێك کە چاوەڕوانی سەرکەوتن دەکات دەبێ زۆر خۆگر بێو گرفتاریو تەنگو چەڵەمە لاوازی نەکاتو لەسەر کارو تەلاشی ئیسلامی خۆی بەردەوام بێو دڵنیابێ کە خوابێ ئاگانیە لێیو بەهانایەوە دێت.

جا خوا دەفەرموێ: ئەوسا ئێمە ئەوەی کەفیرعەونو گەلەکەی دروستیان کردبو لە کۆشك وتەلارو جێگای خۆشو باخو بێستان هەمومان لەناوبرد. جا ﷲ باسی کۆمەڵێکی نەزانی بەنی ئیسرائیل مان بۆدەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٣٨﴾ خۆ ئێمە بەنی ئیسرائیلمان لەو بەحرە پەڕاندەوەو رزگارمان کردن جا ئەوان چاویان کەوت بە گەلێك خۆیان لەمەکۆدابو لە دەوری بەری چەند بتێکیان دا وتیان: ئەی موسا تۆش بتێك بۆ ئێمە دانێ وەك ئەوان کە چەند بتیان هەیە موسایش وتی: بێگومان ئێوە گەلێکی جاهیلو نەفامن ﷲ ئێوەی لەو هەموسەختیوتەنگانە رزگارکرد کەچی ئێوە داوای بت دەکەن وحەزتان لە بت پەرستنە؟!

﴿١٣٩﴾ بێگومان ئەوانەی کەئەوبتانە دەپەرستن گەلێکی فەوتاون وەئەوەی کە ئەوان دەیکەن شتێکی بەتاڵە. جا موسا بۆئەوەی کەبیر بکەنەوە، نیعمەتەکانی پەروەردگاریان بیر ئەخاتەوە،

﴿١٤٠﴾ وتی: ئایا من بێجگە لە ﷲ داوا بکەم کە شتێکی ترخواتان بێ لەحاڵێکدا کە ئەو ئێوەی ڕێزدارو گەورە کردوە بەسەر تەواوی خەڵکی زەمانی خۆتاندا؟

﴿١٤١﴾ دە بیر بکەنەوە لەو کاتەی کە ئێمە ئێوەمان رزگارکرد لە دەستو دایەرەی فیرعەون، ئەو دەستو دایەرەی کە هەمو چەشنە سزایەکیان بەئێوە دەچەژاندو کوڕانیان دەکوشتن تابەو شێوەیە ژمارەتان کەم بکاتەوەو لاوازتان بکاتو ئافرەتەکانتانی دەهێشتەوە بۆ خزمەت پێ کردنو پێ رابواردنیان، وەبەراستی ئالەمەدا بەڵایەکی گەورەبو لەلایەن پەروەردگاری خۆتانەوەو تاقی کردنەوەیەکی گەورە بو بۆتان. بەڵام سودیان لێ وەرنەگرت. جا هەروا خوا درێژە دەدات لە وەبیر خستنەوەیانو دەفەرموێ:

﴿١٤٢﴾ خۆ بەڵێنمان دا بە موسا کەوا سی رۆژلە کێوی "تور"دا بمێنێتەوە بۆئەوەی قسەی لەگەڵدا بکەینو تەواومان کرد بە دە رۆژی تر. واتە دە رۆژی ترمان بۆ زیاد کرد تەفسیر نوسان لەسەر ئەم دە رۆژە ناکۆکیان هەیەو زۆربەیان لەسەر ئەوەن کە سی رۆژی مانگی "زی قەعدە"یەو دە رۆژەکەشی دەی مانگی "زیحجە"یە جا کاتی پەروەردگاری چل شەوی تەواووبێ کەموزیادبو ، ئینجا کاتێ ویستی بچێت هەروا گەلەکەی بێ سەروبەر بەجێ نەهێشت بەڵکو موسا ئامۆژگاری کردنو بەهارونی برای وت: لەباتی من دا لەناو گەلەگەم دانیشەو ئیشی چاكو گونجاو ئەنجام بدەو پەیرەوی خراپەکاران نەکەیت.

﴿١٤٣﴾ جا لەوکاتەدا کە موسا هات بۆلای ئێمە ، وەپەروەردگاری قسەی لەگەڵدا کرد وتی: ئەی پەروەدگارم خۆتم نیشان بدە تا من تەماشات بکەم، فەرموی: تۆ ناتوانی لەدنیادا من ببینی جا چیایەك لەبەرامبەری بو فەرموی: بەڵام تەماشای ئەو چیایە بکە ئەگەر ئەو چیایە خۆی گرت لە شوێنی خۆیدا ئەوسا تۆش دەتوانی من ببینی جا کاتێ پەروەردگار خۆی دەرخست بۆ چیاکە چیاکەی ورد وردو رێزاڵ رێزاڵ کردو موساش بەبێ هۆشی کەوت ئینجا کاتێ بە خۆ هاتەوەو هۆشی کردەوە وتی خوایە پاكو خاوێنی هەربۆ تۆیەو من گەڕامەوە بۆ لای تۆو پەشیمانم لەوەی کە وتومەو من یەکەم باوەڕدارانی ئەم گەلەم.

ئەبو سەعیدی خدری دەڵێ: پیاوێکی جولەکە هاتە لای پێغەمبەرﷺ کە زللەیەك درابو لەناوچاوی وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ یەکێك لە رەفیقەکانت ئەم زللەیەی لێداوم فەرمو ی: بانگی

قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّي ٱصۡطَفَيۡتُكَ عَلَى ٱلنَّاسِ بِرِسَٰلَٰتِي وَبِكَلَٰمِي فَخُذۡ مَآ ءَاتَيۡتُكَ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا لَهُۥ فِي ٱلۡأَلۡوَاحِ مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡعِظَةٗ وَتَفۡصِيلٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ فَخُذۡهَا بِقُوَّةٖ وَأۡمُرۡ قَوۡمَكَ يَأۡخُذُواْ بِأَحۡسَنِهَاۚ سَأُوْرِيكُمۡ دَارَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٤٥﴾ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴿١٤٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآءِ ٱلۡأٓخِرَةِ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٤٧﴾ وَٱتَّخَذَ قَوۡمُ مُوسَىٰ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِنۡ حُلِيِّهِمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٌۚ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّهُۥ لَا يُكَلِّمُهُمۡ وَلَا يَهۡدِيهِمۡ سَبِيلًاۘ ٱتَّخَذُوهُ وَكَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿١٤٨﴾ وَلَمَّا سُقِطَ فِيٓ أَيۡدِيهِمۡ وَرَأَوۡاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ ضَلُّواْ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ يَرۡحَمۡنَا رَبُّنَا وَيَغۡفِرۡ لَنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿١٤٩﴾

بکەن بۆم، ئەوانیش بانگیان کردو وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ من دام بەلای ئەو جولەکەدا گوێم لێ بو وتی سوێند بەو کەسەی موسای هەڵبژاردوە بەسەر هەمو بەشەردا منش وتم بەسەر محمد دیشدا؟ رقم هەستاو ئەو زللەیەم لێدا پێغەمبەرﷺ فەرموی:{ **لَا تُخَيِّرُونِي مِنْ بَيْنِ الْأَنْبِيَاءِ فَإِن الناسَ يَصْعَقُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فَأَكُونُ أول مَنْ يُفِيقُ فَإِذَا أَنا بِمُوسَى آخِذٌ بِقَائِمَةٍ مِنْ قَوَائِمِ الْعَرْشِ فَلا أَدْرِي أَفَاقَ قَبْلِي أَمْ جُزِيَ بِصَعْقَةِ الطور** /البخاري/ من جیانەکەنەوە لەناو پێغەمبەراندا بەراستی رۆژی قیامەت هەمو خەڵك بێهۆش دەکەوێتو من یەکەم کەس دەبم کە بەهۆش دەێمەوە کەچی موسا دەستی گرتوە بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی عەرشەوە نازانم پێش من بەهۆش هاتوەتەوە یان بەهۆی بێهۆش کەوتنی تورەوە لەبێهۆشکەوتن چاو پۆشی لێ کراوە }

﴿١٤٤﴾ خوایش فەرموی: ئەی موسا من تۆم هەڵبژاردوە بۆ خەڵك بەپەیامو وبە قسەی خۆم، وە تۆم کردوە بە پێغەمبەریان جا تۆش وەریگرە ئەوەی کە پێت دەدەمو لە ریزی سوپاسگوزاراندابە.

﴿١٤٥﴾ خۆ ئێمە هەمو شتێکی پێویستی ئەوانمان لەناو ئەو تەختانەی کە بۆمان ناردویت نوسیومانە کەئامۆژگاری زۆرو درێژەدانو رونکردنەوەی هەموشتێکە لەحەرامو حەڵاڵ جا تۆش هەمو هێزی خۆت بخەرەکارەوە بۆ گەیاندنی بەگەلەکەتو

وَلَمَّا رَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗا قَالَ بِئۡسَمَا خَلَفۡتُمُونِي مِنۢ بَعۡدِيٓۖ أَعَجِلۡتُمۡ أَمۡرَ رَبِّكُمۡۖ وَأَلۡقَى ٱلۡأَلۡوَاحَ وَأَخَذَ بِرَأۡسِ أَخِيهِ يَجُرُّهُۥٓ إِلَيۡهِۚ قَالَ ٱبۡنَ أُمَّ إِنَّ ٱلۡقَوۡمَ ٱسۡتَضۡعَفُونِي وَكَادُواْ يَقۡتُلُونَنِي فَلَا تُشۡمِتۡ بِيَ ٱلۡأَعۡدَآءَ وَلَا تَجۡعَلۡنِي مَعَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٥٠﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَلِأَخِي وَأَدۡخِلۡنَا فِي رَحۡمَتِكَۖ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٥١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ ٱلۡعِجۡلَ سَيَنَالُهُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَذِلَّةٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُفۡتَرِينَ ﴿١٥٢﴾ وَٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِهَا وَءَامَنُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٥٣﴾ وَلَمَّا سَكَتَ عَن مُّوسَى ٱلۡغَضَبُ أَخَذَ ٱلۡأَلۡوَاحَۖ وَفِي نُسۡخَتِهَا هُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ هُمۡ لِرَبِّهِمۡ يَرۡهَبُونَ ﴿١٥٤﴾ وَٱخۡتَارَ مُوسَىٰ قَوۡمَهُۥ سَبۡعِينَ رَجُلٗا لِّمِيقَٰتِنَاۖ فَلَمَّآ أَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ قَالَ رَبِّ لَوۡ شِئۡتَ أَهۡلَكۡتَهُم مِّن قَبۡلُ وَإِيَّٰيَۖ أَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلسُّفَهَآءُ مِنَّآۖ إِنۡ هِيَ إِلَّا فِتۡنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهۡدِي مَن تَشَآءُۖ أَنتَ وَلِيُّنَا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَاۖ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡغَٰفِرِينَ ﴿١٥٥﴾

فەرمان بدە بەسەر گەلەكەت دا كەبەجوانی وەری بگرن‌و پەیڕەوی بكەن بەم زوانە ماڵ‌وجێگای فاسقانتان پیشان دەدەم . ئەمە هەڕەشەیەكی توندە لە تاوانباران‌و دەگونجێ مەبەستیش جێگای فیرعەون‌و دەستو دایەرەكەی بێ بەلاّم ئەوەڵم پێ نزیكترە چونكە ئەمە پاش پەڕینەوەی بەنی ئیسرائیلەو دەفەرموێ:

(١٤٦) بەم زوانە لایان دەدەم لە نیشانەكانی خۆم ئەوانەی كەبەناحەق خۆیان گەورە دەكەن لە سەر زەویدا، واتە خۆبەزلزانی ئەوان دەبێت بەهۆی رق‌و قینی خواو نائومێدیان دەكات لەباوەڕهێنان ، وەئەگەر هەمو بەڵگەكان ببینن هەرباوەڕناهێنن بەو بەڵگانە، وەئەگەر ڕێگای راستیش ببینن نایكەن بەڕێبازی خۆیان! وە ئەگەر ڕێگای خراپ ببینن دەی كەن بەڕێبازی خۆیان! ئەمەش ئەوەنەبێ كە خوا ستەمیان لێ بكات بەڵكو لەبەر ئەوەیە كە بێ باوەڕبون بە نیشانەكانی ئێمە ئەوان بێ ئاگابون و بەهۆی لاساری خۆیانەوە لەراستی تێ نەگەیشتن.

(١٤٧) جا ئەو كەسانەی كە بێ باوەڕبون بە نیشانەكانی ئێمەو بێ باوەڕبون بە ڕۆژی قیامەت‌و حیساب، هەرچی كردەوەی چاكیشیان بوبێت هەموی هەڵوەشایەوە، ئەمە بەڵگەیەكی روونە كە كردەوەی چاكی بێ باوەڕو كافران سودی نابێ بۆ ڕۆژی قیامەت ، چونكە مەرجی پاداشی قیامەت لەسەر چاكە باوەڕبوونە بەو ڕۆژەو هەڵنەوەشاندەوەیەتی بەشیرك‌و پاشگەز بوونەوە، ئینجا ﷲ دەفەرموێ: ئایا پاداش درانەوە بەشتێك بێجگە لەو كارو رەفتارانەی كە خۆیان كردبویان، واتە هیچ ستەمێكیان لێ نەكراوە بەڵكو تەلاش‌و رەفتارەكەی خۆیان هەرئەوە پاداشەی لایق بووە وەك وتراوە "چۆن بپێوی وات بۆ دەپێورێت، ئەگەر چاك‌و بەچاك، وەئەگەر خراپ‌و بەخراپ". دیسان ﷲ دەنگو باسی ئەو گەلەی موسا مان بۆ دەگێڕێتەوە كاتێ كە موسا چو بۆ تور بۆقسەو گفتوگۆ لەگەڵ خوادا كەپاش ئەو كابرایەك بەناوی سامیری لەو زێڕەی كەلە قیبتیەكانەوە دەستیان كەوتبو وێنەی گوێرەكەیەكی دروست كردو مشتێ خاك كەلە ژێرپێی ئەسپی جبرەئیل دا هەڵی گرتبو كردیە دەمیەو گوێرەكەكە قۆڕاندی كەئەم باسە بەدرێژی لە سورەتی(تاها)دا باسكراوە لێرەش دەفەرموێ:

(١٤٨) پاش ئەوەی كە موسا چو بۆ كێوی تور گەلەكەی لەو زێڕەی كەلایان بو بەدەستی سامیری گوێرەكەیەكیان دروست كرد كەتەنها قۆڕەی لێوە دەهات وەك وتمان جا بەمە خۆش حاڵبوون‌و كردیان بەخوای خۆیان ، بۆیە خوا سەرزەنشتیان دەكات‌و دەفەرموێ: مەگەر ئەوان نابینن كە ئەو خوای ئەوانە هیچ قسەیەكیان لەگەڵدا ناكات‌و بۆ هیچ ڕێگایەك ڕێنماییان ناكات؟ كەچی ئەوان كردیان بە خوای خۆیان!! وەئەوان ستەمكاربون، ئەگینا چۆن شتی وایان دەكرد بەڵێ، پاش گەڕانەوەی موساو سەرزەنشت كردنیان‌و دەركردنی سامیری‌و سوتانی گوێرەكە كە زانیان كە هەڵەن ، پەشیمان بونەوە وەك دەفەرموێ:

(١٤٩) لە كاتێكا كەداریان لەدەست كەوت‌و هیچ قسەیەكیان نەبو زانیان كە بەراستی ئەوان گومڕاهـ بوون، وتیان: بەراستی ئەگەر پەروەردگارمان رەحممان پێ نەكات‌و لێمان خۆش نەبێت ئەوە ئیتر بێگومان ئێمە لە ریزی زیان لێ كەوتو رەنجەڕۆیان دا دەبین.

(١٥٠) جا كاتێ كە موسا گەڕایەوە بۆ لای گەلەكەی زۆر تورەو دڵپڕ لەداخ بو لە سەر ئەو ئیشە خراپەی كە گەلەكەی كردبوی، وتی: بەراستی ئێوە خراپترین جێ نشین بون بۆ من ، لە پاش من ئێوە بۆ پەلەتان كرد بەر لەئەوەی كە فەرمانی پەروەردگارتان پێ بگات؟ ئینجا موسا كەئەم وەزعەی گەلەكەی بینی زیاتر رقی هەستاو ئەو "لەوحانە"ی كەلە كێوی توردا لەلایەن خواوە وەری گرتبون فڕەیدان‌و پرچی هارونی برای گرت‌و رایكێشا بۆلای خۆی چونكە وای دەزانی كە ئەو كۆتایی كردوە لە ئەمر بەچاكەو بەرگری لە خراپەدا، براكەی وتی: ئەی كوڕی دایكم ئەم گەلە

منیان لەدەست خستو خەریك بو بمكوژن جا تۆ دادو قاڵ مەكە لەگەڵ منداو دوژمنانم پێ شادمان مەكەو من لە ریزی گەلی ستەمكاراندا دا مەنێ بەراستی من ئامۆژگاریم كردن ، وەبۆ ئەوەش من لێیان جیا نەبومەوە نەوەك تۆ بڵێیت: لەناو گەلەكەدا دووبەرەكیت دروستكردوە. بەڵێ، موسا زانی كە هارون هیچ تاوانی نیە بۆیە

(١٥١) وتی ئەی پەروەردگارم خۆشبە لەمنو لەبراكەمو بمان خەرە ناو رەحمەتو سۆزی خۆتەوەو تۆ لە هەمو بەرەحمو بەسۆزەكان بەرەحمو بە سۆزتری. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٥٢) بە بێگومان ئەوكەسانەی كە گوێرەكە(گۆلك)یان پەرست بەم زوانە غەزەبی پەروەردگاریانو سەرشۆڕیان هەرلەم سژیانەی دنیادا پێ دەگات ، ئەوەبو كە تەوبەی لێ وەرنەگرتن هەتا هەندێكیان هەندێكتان نەكوشت وەك لە سورەتی "بەقەرە"دا باسمان كرد سەرشۆڕیشن هەتا رۆژی قیامەتو بێ خۆبەستنەوە بەخەڵك ناژین، وەهەر ئاوەها ئێمە تۆڵە لەو كەسانەی وەردەگرین كە درۆ بەدەمی ئێمەوەدەكەن. جا ئەمە هەڕەشەیەكی زۆر توندیشە لەبەناو موفتیانی ئەم سەردەمە كە بێ ئەوەی ئاگاداری ئایین بن فتوا بەناو خواو پێغەمبەرەوە ﷺ دەدەن. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٥٣) جا ئەوكەسانەی كە كرداری خراپیان كردوەو لەپاشا گەڕاونەتەوە پاش ئەو كردارە خراپانەو تەوبەیان كردو باوەڕیان هێنا بێگومان پەروەردگارت ئەی محمدﷺ لەپاش ئەو تاوانانەیش كە كردیان زۆر لێ خۆش بوو بەسۆزە بۆ بەندەكانی. ئەی مرۆڤی لەخۆ باییو گەنەكێڵ بەراستی ئەمە موژدەیەكی زۆر خۆشە بۆ تاوانبارانێ كە پەشیمان دەبنەوە ، بەڵێ ، نابێ كەس نائومێد بكرێت لە سۆزو رەحمەتی خوا هەرچەند تاوان كاریش بێ مادام لەژیاندابێت. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٥٤) جا لەكاتێكدا كە توڕەییەكەی موسا هێواش بوویەوە ئەوسا ئیتر لەوحەكانی هەڵگرتەوە، ئەو لەواحانەی كەلە بەر تۆڵەسەندنەوە لەفەرمان شكێنانی خوا دایان ، وەئەوەی كە نوسرابو لە ناو ئەو لەواحانەدا هەم هیدایەتو رێنمایو هەم رەحمەت بو بۆ ئەو كەسانەی كە دەترسان لە پەروەردگاریان، **لەوح:** واتە تەختە هەندێك دەڵێن: لە گەوهەری بەهەشت بوون واللە اعلم، ئینجا خوا درێژە بەباسی موساو گەلەكەی دەدات بۆ پێغەمبەرمانﷺ و دەفەرموێ:

(١٥٥) ئەوسا موسا لەگەلەكەی حەفتا نەفەری هەڵبژارد بۆ ئەوەی كە بچن بۆ ئەو جێگایەی كە موسا قسە لەگەڵ ئێمەدا دەكات لە

۞ وَٱكۡتُبۡ لَنَا فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِنَّا هُدۡنَآ إِلَيۡكَۚ قَالَ عَذَابِيٓ أُصِيبُ بِهِۦ مَنۡ أَشَآءُۖ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖۚ فَسَأَكۡتُبُهَا لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِنَا يُؤۡمِنُونَ (١٥٦) ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلۡأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكۡتُوبًا عِندَهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنۡهُمۡ إِصۡرَهُمۡ وَٱلۡأَغۡلَٰلَ ٱلَّتِي كَانَتۡ عَلَيۡهِمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِهِۦ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَٱتَّبَعُواْ ٱلنُّورَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ مَعَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ (١٥٧) قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِ ٱلنَّبِيِّ ٱلۡأُمِّيِّ ٱلَّذِي يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَكَلِمَٰتِهِۦ وَٱتَّبِعُوهُ لَعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ (١٥٨) وَمِن قَوۡمِ مُوسَىٰٓ أُمَّةٞ يَهۡدُونَ بِٱلۡحَقِّ وَبِهِۦ يَعۡدِلُونَ (١٥٩)

كاتی دیاریكراوماندا، دەڵێن: موسا ؑ حەفتا پیاوی چاكی بەنی ئیسرائیلی هەڵبژاردو پێی وتن: ئێوە بە نوێنەری باقی خەڵكەكەی ترەوە بچنو پەشیمانی خۆتان لەوەی كەكردوتانە دەربڕنو داوای لێ بكەن كە تۆبەی ئێوەو باقی خەڵكەكەی تر وەرگرێتو رۆژو بگرنو خۆتان پاك بكەنەوەو پۆشاكتان خاوێن بكەنەوە، جا موسا ئەمانەی برد بۆ كێوی تور لەوكاتە دیاری كراوەدا ـ موسا نەدەهات بۆ كێوی تور مەگەر خوا خۆی ماوەی پێ بدایە ـ ئەم حەفتا كەسەیش بەموسایان وت: داوا بكە لە پەروەردگارت با ئێمەش گوێمان لە فەرمودەی خوابێت كاتێ كەگفتوگۆ لە گەڵ تۆدا دەكات موسایش وتی: وادەكەم، كاتێك موسا نزیكی چیاكە كەوتەوە پەڵەیەكی هەور بەسەر چیاكەدا كەوتو كەم كەم چیاكەی داپۆشیو موسا لێی نزیك كەوتەوەو چوە ناو هەورەكەوەو وتی: بە ئەوانەیش كەلەگەڵیا بوون نزیك ببنەوە جاموسا كاتێك كەخوا قسەی لەگەڵدا دەكرد روناكیەكی وا دەیدا بەناو چاویدا كە هیچ بنیامێك نەی دەتوانی تەماشای بكات ئەوسا پەردەیەكی بۆدانراو گەلەكەیشی نزیك بوونەوە هەتا چونە هەورەكەوەو هەمویان بەشێوەی سوجد بردن سوجدەیان برد جا لەو كاتەدا گوێیان لە گفتوگۆی خوابو لەگەڵ موسادا فەرمانی پێدەداو دەیفەرمو بیكەو لەهەندێ شت بەرگری دەكردو دەیفەرمو نەیكەیت، كاتێ لە فەرمانەكانی بویەوە هەورەكەنەماو موسا بەرەو لای ئەوان گەڕایەوە، ئەوانیش وتیان: ئەی موسا ئێمە باوەڕت پێ ناكەین هەتا خوا بەچاوی خۆمان نەبینین، ئینجا

وَقَطَّعۡنَٰهُمُ ٱثۡنَتَيۡ عَشۡرَةَ أَسۡبَاطًا أُمَمٗاۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ إِذِ ٱسۡتَسۡقَىٰهُ قَوۡمُهُۥٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡحَجَرَۖ فَٱنۢبَجَسَتۡ مِنۡهُ ٱثۡنَتَا عَشۡرَةَ عَيۡنٗاۖ قَدۡ عَلِمَ كُلُّ أُنَاسٖ مَّشۡرَبَهُمۡۚ وَظَلَّلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡغَمَٰمَ وَأَنزَلۡنَا عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰۖ كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡۚ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿١٦٠﴾ وَإِذۡ قِيلَ لَهُمُ ٱسۡكُنُواْ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةَ وَكُلُواْ مِنۡهَا حَيۡثُ شِئۡتُمۡ وَقُولُواْ حِطَّةٞ وَٱدۡخُلُواْ ٱلۡبَابَ سُجَّدٗا نَّغۡفِرۡ لَكُمۡ خَطِيٓـَٰٔتِكُمۡۚ سَنَزِيدُ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٦١﴾ فَبَدَّلَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡ قَوۡلًا غَيۡرَ ٱلَّذِي قِيلَ لَهُمۡ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٦٢﴾ وَسۡـَٔلۡهُمۡ عَنِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَتۡ حَاضِرَةَ ٱلۡبَحۡرِ إِذۡ يَعۡدُونَ فِي ٱلسَّبۡتِ إِذۡ تَأۡتِيهِمۡ حِيتَانُهُمۡ يَوۡمَ سَبۡتِهِمۡ شُرَّعٗا وَيَوۡمَ لَا يَسۡبِتُونَ لَا تَأۡتِيهِمۡۚ كَذَٰلِكَ نَبۡلُوهُم بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٣﴾

دەنگێکی توند هاتو هەمویان مردن ئیتر موسایش زۆر دڵتەنگ بو دەستی کرد بەتکاو لالە لە خواو چاوەڕێ بو کە خوا وەڵامی بداتەوە وەك دەفەرموێ: کاتێ کە ئەو دەنگە لێیدان موساوتی: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئارەزوت لێبوایە پێش ئەوەی کە ئێمە بێینە ئێرە ئەوانت دەکوشتو منیش ئایا ئێمە لەناو دەبەیت بەهۆی ئەو کردارەی کە گێل‌و کەم عەقڵەکانی ئێمە کردویانە کە ئەوەش بێجگەلە تاقی کردنەوەیەکی خۆت شتێکی ترنیەو هەر خۆتی بەو تاقی کردنەوە گومڕا دەکەیت ئەوکەسەی کە ئارەزوت لێ بێ‌و ڕێنمای دەکەیت ئەوکەسەی کە ئارەزوت لێ بێ، تۆهەرخۆتیت سەرپەرشتی ئێمە سا چاوپۆشیمان لێ بکەو بەزەییت بێت پێماندا، وەتۆ چاکترینی هەمو چاوپۆشیکەرانی.

﴿١٥٦﴾ سا ئەی خودایە لەم دنیادا چاکەمان بۆ بنوسەو هەربە چاکەوە خەریك بین، وەلە ڕۆژی دوایشدا هەرچاکەمان پێ بدە، بەبێگومان کەئێمە گەڕاینەتەوە بۆلای تۆو پەشیمانین، خوایش لە وەڵامی پاڕانەوەی موسادا فەرموی: سزای خۆم دەدەم بەسەر هەرکەسێکدا کە ئارەزوم لێ بێ سزای بدەم‌و سۆزەکەیشم هەمو شتێك دەگرێتەوە جابەم زوانە ئەو سۆزەی خۆم دەنوسم بۆ ئەو کەسانەی کەلە خوای خۆیان دەترسن‌و زەکات دەدەن‌و ئەو کەسانەی کە بەنیشانەکانی ئێمە باوەڕدەهێنن، جا خوا زیاترپێناسەی ئەو کەسانەمان بۆدەکات‌و دەفەرموێ:

﴿١٥٧﴾ ئەو کەسانەن کە پەیڕەوی دەکەن لەو پێغەمبەرە نەخوێندەوارەی کە لە لای ئەو جولەکەو فەلانە لەناو تەوراتو ئینجیل دا ناوی ئەویان بەتۆمار کراوی دەست دەکەوێت، کە فەرمانیان پێدەکات بە چاکەکردن‌و بەرگریان دەکات لە خراپە کردن‌و هەمو شتێکی پاکیان بۆ حەڵاڵ دەکات‌و هەمو شتێکی پیسیان لێ قەدەغە دەکات‌و ئەو بارە قورسانەی کەلەسەرشانی ئەوانبوە لایدەبات وەك خۆشۆردن بۆخۆپاك گردنەوەلەمیزو نەخەوتن‌و نەخواردن لەگەڵ ئافرەتی حەیزدارداو بچڕاندنی پۆشاك کاتێ کەتکەیەك میزی پێوە بدرایە، وەئەو کۆت‌و زنجیرەی کەلە سەر ئەوان بوە، وەك خۆکوشتنەوە لەباتی تەوبەداو قەدەغە بوونی ئیش لەڕۆژی شەممەدا ، لەسەر ئەوانەی کە پەیڕەوی دەکەن لایدەبات جا ئەوکەسانەی کە باوەڕیان پێ هیناوو پشتیوانیان لێ کردوو یارمەتیان داوو پەیڕەوی ئەو قورئانەیان کرد کە بۆ ئەو ڕەوانە کراوە بەڕاستی ئائەوانە سەرکەوتو ڕزگارن، ئینجا خوا ڕوبە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ دەفەرموێ:

﴿١٥٨﴾ ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەی خەڵکینە بێگومان کە من پێغەمبەری خوداو ڕەوانە کراوم بۆلای ئێوە هەموتان، کە تەنها ئەو خاوەنی ئاسمانان‌و زەوییەوهیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر بێجگە لە ئەو نیە کە هەر ئەوەزیندوو دەکاتەوەو دەمرێنێ دەسا ئێوەش باوەڕبهێنن بە ﷲ وبەئەو نێرراوەی کە ئەوپێغەمبەرە نەخوێندەوارەیە کە باوەڕی هەیە بە خواو بە فەرمودەو فەرمانە کانی‌و ئێوەش پەیڕەوی بکەن بەڵکو ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە. ئەمەش بەر پەرچدانەوەیەکی توندە بۆ ئەو کەسانەی کە دەڵێن: پێغەمبەرﷺ لەئەوەڵەوە هەرخەڵکی مەکەی مەبەست بوە پاش تر عەرەب‌و لەپاشا تەماع گرتی‌و بانگی هەمو خەڵکی کردوە، چونکە ئەم سورەتە مەکیەو هەرلە سەرەتاوە بانگەوازەکەی بۆ هەمو خەڵك بوە وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ../ سبأ: ٢٨/ وە ئیمە تۆ مان ڕەوانە نەکردوە مەگەر بۆ گشت خەڵك..﴾

﴿١٥٩﴾ جا لە ناو گەلی موسادا واتە بەنی ئیسرائیلی تاقمێك هەن کە ڕێگای ڕاست دەدۆزنەوە کە پەیڕەوی کردنیانە لە قورئان‌و بەو هۆیەوەڕاست دەڕۆن. واتە گەلی موسا هەمویان وەکو یەك نەبوون‌و نین بەڵکو لەناو ئەو گەلەدا کەسانێك هەن کە ڕاستی بزانن‌و پەیڕەوی لەڕاستی بکەن وەك: عەبدوڵای کوڕی سەلام‌و سەدانی تریش . ئینجا لێرە بەدواوە تا کۆتایی ئایەتی

سەدوشەستودووله سورەتی"بەقەر"دا بە کەمێ جیاوازییەوە هاتوەو لێرە بەپەلە تر بەسەریا دەڕۆین. دەفەرموێ:

(١٦٠) خۆ ئەوانمان کرد بە دوانزە بەرەباب‌و دوانزە تیرەو وەحیمان کردە لای موسا کاتێك کە گەلەکەی داوای ئاویان لێ کردو وتمان: عەساکەت لەو بەردە بدە؟،دیارە موسایش فەرمانەکەی جێ بەجێکردوعەساکەی لێدا کت‌و پڕ دوانزە کانی لەو بەردە هاتەدەرەوە هەرکانیەك بۆ یەك بەرەباب، هەمو بەرەبابێك کانی خۆی دەناسی‌و لەوەی خۆی سودی دەبردو بەم شێوە لەشەڕو دەمە قاڵەی سەرئاو رزگاریان بو، ئینجا خوا باسی نیعمەتێکی تری دەکات بۆ ئەوان‌و دەفەرموێ: وەبەهەور سێبەریشمان بۆکردن‌و گەزۆو شیلاقەمان پێدان واتە خۆشترین شیرینی‌و بەتام ترین گۆشتی پێدان، ئینجا ﷲ پێی فەرمون: بخۆن لەو شتەپاکانەی کە ئێمە پێمان داون‌و ئەوان ستەمیان لە ئێمە نەکردوە بەڵکو ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردوە واتەلەو ئیشە ناپەسەندو خراپەیان تەنها زیانیان بەخۆیان گەیاندوە، دیسان خوا دەفەرموێ:

(١٦١) دەی باس بکە بۆیان ئەو کاتەی کە پێیان وترا بچن لەو گوندەدا بۆ خۆتان دانیشن‌و بخۆن لە هەرکوێدا کە ئارەزۆتان لێ هەیەو بڵێن خوایە ئەو گوناهانەی کەکردومانە لەسەرمان لابەو بەحاڵەتی سوجدەبردنەوە لەو دەرگانەوە بچنەناوەوە جا ئەگەر واتان کرد ئێمەش لەگوناهەکانتان خۆش دەبین‌و لەمەولا پاداشتی چاکەکارتان زۆر دەکەین ، پاداشتی چاکەکاران زیاد دەکەین.

(١٦٢) بەڵام ئەو ستەمکارانەی ناوئەوان ئەوقسەیان گۆڕی بەقسەیەکی تر بێجگەلەوەی کە پێیان وترابو ئەوسائێمەش لە ئاسمانەوە سزامان بۆناردن بەهۆی ئەو ستەمەی کەکردیان. دەڵێن: لەباتی ئەمەدا کە بڵێن خوایە تاوانەکانمان لەسەر لابە دەیان وت: خوایە گەنمان پێ بدە واتە لەباتی(حِطَّةٌ) ، (حنطة)یان دەوت هەربۆیە خوا رقی لێ هەستان‌و سزای بۆناردن. ئینجا خوا بە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:

(١٦٣) ئەی محمدﷺ لەبارەی ئەو گوندەی (کەلەسەر دەریایی "قەلزەم" بو) پرسیاریان لێ بکە ئەوکاتەی کە لە شەممەدا دەستدرێژیان کردو فەرمانی خوایان شکاند ئەوکاتەی کە ماسیەکان لەرۆژی شەممەدا بەزۆری دەهاتن‌و ئەو رۆژەی کە رۆژی شەممەیان نەبوایە نەدەهاتن هەر ئابەم شێوەیە ئێمە ئەوانمان گرفتار کرد بەهۆی ئەوەی کەئەوان هەموسنورێکیان بەزاندبو. ئەمەش دەمکوتێکە بۆ ئەوانەی کەوا دەزانن بەرژەوەندی (المصلحه) هەمو شتێکەو وەك خوا دەیپەرستن؟!

وَإِذۡ قَالَتۡ أُمَّةٞ مِّنۡهُمۡ لِمَ تَعِظُونَ قَوۡمًا ٱللَّهُ مُهۡلِكُهُمۡ أَوۡ مُعَذِّبُهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدٗاۖ قَالُواْ مَعۡذِرَةً إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾ فَلَمَّا نَسُواْ مَا ذُكِّرُواْ بِهِۦٓ أَنجَيۡنَا ٱلَّذِينَ يَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلسُّوٓءِ وَأَخَذۡنَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ بِعَذَابِۭ بَـِٔيسِۭ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿١٦٥﴾ فَلَمَّا عَتَوۡاْ عَن مَّا نُهُواْ عَنۡهُ قُلۡنَا لَهُمۡ كُونُواْ قِرَدَةً خَٰسِـِٔينَ ﴿١٦٦﴾ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكَ لَيَبۡعَثَنَّ عَلَيۡهِمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَن يَسُومُهُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِۗ إِنَّ رَبَّكَ لَسَرِيعُ ٱلۡعِقَابِ وَإِنَّهُۥ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٦٧﴾ وَقَطَّعۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُمَمٗاۖ مِّنۡهُمُ ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنۡهُمۡ دُونَ ذَٰلِكَۖ وَبَلَوۡنَٰهُم بِٱلۡحَسَنَٰتِ وَٱلسَّيِّـَٔاتِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٦٨﴾ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٞ وَرِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ يَأۡخُذُونَ عَرَضَ هَٰذَا ٱلۡأَدۡنَىٰ وَيَقُولُونَ سَيُغۡفَرُ لَنَا وَإِن يَأۡتِهِمۡ عَرَضٞ مِّثۡلُهُۥ يَأۡخُذُوهُۚ أَلَمۡ يُؤۡخَذۡ عَلَيۡهِم مِّيثَٰقُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن لَّا يَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّ وَدَرَسُواْ مَا فِيهِۗ وَٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ يَتَّقُونَۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٦٩﴾ وَٱلَّذِينَ يُمَسِّكُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُصۡلِحِينَ ﴿١٧٠﴾

ئینجا خوای زانا بەسەرهاتێکی تری ئەوانمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٦٤) دەی وەبیر بخەرەوە ئەو کاتەی کە تاقمێك لەوان وتیان: بۆ ئامۆژگاری گەلێ دەکەن کە خوا فەوتاندونی؟ جا ئەمە دەگونجێ هەر ئەو کۆمەڵەبن کەبە شێوەی ناڕەوا دەستیان کرد بەماسی گرتن‌و کۆمەڵێك ئامۆژگاری کردبن جاکۆمەڵێکی تر پاش چەند ئامۆژگاری‌و بێ سود بوونی وتیان: بۆئامۆژگاری گەلێ دەکەن کە خوا فەوتاندونی یان سزایان دەدات؟ وتێان بۆیە ئەمە دەکەین تابەهانەیەك بێ بۆمان لای پەروەردگارتان واتە فەرمان بەچاکەو بەرگری لە خراپە ئەرکی سەرشانمانەو بەهیوای ئەوەش بەڵکوخۆبپارێزن لە تاوان‌و خراپە. ئەوسا خوا دەفەرموێ:

(١٦٥) جا لە کاتێکدا کەلەبیریان چویەوە ئەوەی کە ئامۆژگاریان پێ کرابوو هەر سوربون لەسەر راوەماسی لە شەممەدا ئەوساخوا سزای بۆناردن وەك دەفەرموێ: رزگارمان کرد ئەوکەسانەی کەبەرگریان دەکرد لە خراپەو هیچ زیانێکیان توش نەهات، بەڵام سەبارەت بەتاوان باران دەفەرموێ: وەتۆڵەمان سەندەوە لەوکەسانەی کە ستەمیان کردبو بەسزایەکی زۆر توند بەهۆی ئەوەی کەلە سنور دەرچوبون.

(١٦٦) جا لەو کاتەی کەسەرکەشیان کردو لە فەرمانی خوا لایانداو خەریکی ئەوکارەبون کە بەرگریان لێ کرابو لەوکاتەدا پێمان وتن

۞ وَإِذۡ نَتَقۡنَا ٱلۡجَبَلَ فَوۡقَهُمۡ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٞ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعُۢ بِهِمۡ خُذُواْ مَآ ءَاتَيۡنَٰكُم بِقُوَّةٖ وَٱذۡكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾ وَإِذۡ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِيٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَأَشۡهَدَهُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ أَلَسۡتُ بِرَبِّكُمۡۖ قَالُواْ بَلَىٰ شَهِدۡنَآۚ أَن تَقُولُواْ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنۡ هَٰذَا غَٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوۡ تَقُولُوٓاْ إِنَّمَآ أَشۡرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةٗ مِّنۢ بَعۡدِهِمۡۖ أَفَتُهۡلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿١٧٣﴾ وَكَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ وَلَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿١٧٤﴾ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ﴿١٧٧﴾ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٧٨﴾

ببن بە مەیمونێکی ناشیرین، بەڵێ، خوا بەوشێوەیە ئەو گەلەی لە دنیادا سزاداو کردنی بە مەیمون، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٦٧) جا باس بکە ئەوکاتەی کە پەروەردگارت رایگەیاند کە بەدڵنیاییەوە هەمیشە کەسانێك دەنێرمە سەر جولەکە کە خراپترین سزایان بدات هەتا رۆژی قیامەت بێگومان کە خوای تۆ زۆر بەپەلەیە لەتۆڵە سەندنەوەداو بێگومان کە ئەوزاتەزۆر لێ خۆشبوو بەرەحمە بۆ ئەوکەسانەی کە دەگەڕێنەوەو تەوبە دەکەن. واتە جولەکە تالەسەر ئەو بیرو باوەڕەبن هەرگیز خۆشی بەخۆیانەوە نابینن‌و سەربەخۆ نابن‌و ناپارێزرێن مەگەر کەسانێکی بەهێزتر لە خۆیان پشتیان بگرێت وەك زل هێزەکانی ئەمڕۆ، ئینجا دەفەرموێ:

(١٦٨) ئەوسا لە زەویدا ئەوانمان کرد بەچەندگەل و تیرەو تاقمێك کە لەناو ئەواندا مرۆڤی باشیان هەبوە کە باوەڕی هێناوەو موسڵمان بوەو هەندێکیان ئاوەها نەبون‌و باوەڕیان نەهێناوەو بەکافری مردون، وەئەوانمان تاقی کردەوە بە دەسەڵات‌و بەزۆری نیعمەت‌و بەهەرزانی‌و بە بەڵاو موسیبەت‌و ناڕەحەتیش بەڵکو بگەڕێنەوە بەڵام ئەوان سودیان لێ وەرنەگرتوە. ئینجا خوا فەرموێ:

(١٦٩) جا لە پاش ئەوان کۆمەڵێکی تری بێ خەیرهاتن کەئەم کتێبەیان لەباب‌و باپیرانیانەوە بۆ مابووەوە کەبەگۆڕینی ئایەتەکانی ئەو کتێبە کەلوپەلێکی ئائەم دنیا بێ نرخەیان پێ وەر دەگرت‌و ئایەتەکانی خوایان دەگۆڕییەوە بەشتێکی زۆرکەم.

پێویستە ئەوەش بزانین کەهەمو دنیا بدرێت بەکەسێك لەسەر گۆڕاندنی ئایەتێکی خوا ئەوکەسە زیانی لێ کەوتوە چونکە ئەم ژیانە زۆر کورتەو هەردەبێت دەرچێت لێی پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت، جا ئەمانە تاوانیان دەکردو کاتێك کەئامۆژگاری دەکران دەیان وت: هەر ئەمجارەیەوبەم زووانە خوا لێمان خۆش دەبێت ، وە ئەگەر هەم کەلو پەلێکی تری وەکو ئەوەی پێشویان دەست کەوتایەوە دیسان ئەوتاوانەی پێشویان دەکردەوە واتە ئەگەر چی بەدەم دەیان وت: بەم زووانە خوا لێمان خۆش دەبێت بەڵام هەمیشە بەردەوام بوون لەسەر تاوان، بۆیە خوا سەرزەنشتیان دەکات‌و دەفەرموێ: ئایا لەو کتێبەدا پەیمانی پتەویان لێ وەرنەگیراوە کەنابێ قسەی ناڕەوا بەدەم خواوە بکەن؟ کواو لە کوێدا نوسراوە کە ئێوە تاوان بکەن‌و گوێی مەدەنێ چونکە خوا لێتان خۆش دەبێ؟ دەی بۆ درۆبەدەم خواوە دەکەن وسەر لە خۆتان‌و خەڵکیش تێك دەدەن؟ بەداخەوە ئەمڕۆیش بەهەرکەس دەڵێیت تاوان مەکە دەڵێ: خوا بەرەحمە. راستەکە خوا بەرەحمە بەڵام تۆڵەکەیشی زۆر سەختە. جا خوا سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات‌و دەفەرموێ: خۆیشیان لەو کتێبەدا ئەمەیان خوێندوەتەوە کەبەردەوامبون لە سەر تاوان ، تاوانێکی گەورەیەو خوا چاو پۆشی لێ ناکات. ئینجا خوای میهرەبان هەڵیان دەنێ بۆ بیر کردنەوەو گەڕانەوە بەرەو ئاینی خۆی‌و دەفەرموێ: بەراستیماڵی دوایی چاکە بۆ ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن لەو شتانەی کەدەبنە هۆی رق‌و قینی ﷲ ئایا ئێوە ژیریتان ناخەنەکارەوە تا تێ بگەن‌و بزانن کە هەرئەو جێگایە چاکە؟ بەڵێ بەراستی ئەو جێگا بەنرخەیە کەحەقە مرۆڤ هەمو سەختیەکی لە پێناویدا بەدڵ‌و بەگیان وەرگرێت، ئینجا خوا وەسف‌و سەنای ئەوکەسانە دەکات کەبەهۆی بیرکردنەوە لەو کتێبەی لایانە پەیڕەوی پێغەمبەرمانﷺ دەکەن‌ودەفەرموێ:

(١٧٠) ئەوسا ئەوکەسانەی کەدەستدەگرن بەو کتێبەوەو نوێژ دەکەن ئەوانە چاکەکارن‌و بەبێگومان ئێمەش پاداشتی پیاو چاکان زایەناکەین. واتە وەك لەپێشدادەستیان بەتەوراتەوە گرتوە بەراستی لەپاشداباوەڕیان بەم قورئانەش هێناوە.

ئینجا ﷲ بەسەرهاتێکی تری جولەکەمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٧١) دەی باس بکە بۆیان ئەوکاتەی کە ئەو کەژەمان لەبن دەرهێناو بەرزمان کردەوە بەسەریاندا وەك ئەوەی کە هەورێك بێ بەسەریانەوەو رامانگرت. ئیتردڵنیابون کەئەمە دەکەوێت

بەسەریاندا، پێمان وتن: بەهەمو هێزو توانای خۆتانەوە ئەم پەیامە هەلگرن‌و بیربکەنەوە لەوشتانەی کەلەو پەیامەدایە تا زیاتر لە خوا بترسن‌و باشتر خۆتان لە تاوان بپارێزن. دەڵێن کاتێك موسا عليه السلام لەوحەکانی هەلگرت‌و بردنی بەرەو بەیتولموقەددەس‌و فەرمانەکانی خوای پێ راگەیاندن بەلایانەوە قورس بوو بۆیە خوا ئەو کەژەی هەلکەندو بەسەرئەواندا رایگرت‌و فەرموی: بگرن ئەوەی کە ئێمە پێمان داون‌و هەوڵی بۆ بدەن ، نەك بە شێوەیەکی سادەو سەردەستیانە بیری لێ بکەنەوە ، چونکەئەوە پەیامی خوایەو پێویستە موسڵمانان بەدڵ‌و بەگیان هەوڵی بۆ بدەن‌و هەمو توانایان بخەنە کاربۆی ئەگینا خوای خاوەن دەسەڵات لە هەردوو ژیانماندا سەرشۆڕو داماومان دەکات کەسێکیش کەخوا سەر شۆڕی بکات بەکەس سەربەرزنابێت. بەداخەوە ئەمڕۆ کەئێمە خۆمان بەموسڵمان دەزانین کەچی بێجگەلە چەند شیعارێك کە ئەویش زۆربەیان بێ ناوەرۆك‌و پوچن هەمو یاساو فەرمانەکانی ئاینمان پشت گوێ خستوەو لای هەندێکیشی باسکردنیان تاوانە؟ لەوڵاتی ئیسلامی‌و لەلای ئەولادی موسڵمان ئیشی ئیسلامی‌و هەوڵدان بۆ ئیسلام‌و سەقامگیر کردنی یاساکانی قەدەغەیە!! **ولاحول ولاقوة إلابا .**

ئینجا الله خەبەرمان پێ دەدات کەنەوەکانی پاش ئادەم هەمویان شایەتی دەدەن لەسەر خۆیان کە خوا پەروەردگارو خاوەنیانەو دەزانن کەهیچ پەرستراوێکی راستەقینە نیە بێجگە لە خوا چونکە خوا مرۆڤی لەسەر ئەو بیرو باوەڕە راستە دروست کردوەو دەفەرموێ:

(١٧٢) ئەی محمدﷺ باس بکە بۆیان ئەو کاتەی کە پەروەردگارت لەنەوەی ئادەم لەپشتیاندا پەیمان‌و عەهدی وەرگرتووە خۆیانی کردوە بەشایەت لە سەر نەفسی خۆیان‌و پێی فەرمون: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ، تۆ پەروەردگاری ئێمەیت ، شایەتیمان دا، تاله رۆژی قیامەتدا نەڵێن ئێمە لەم بارەوە بێ ئاگایین ئەم ئایەتە بەدوو جۆر مانای لێدراوەتەوە یەکەمیان مەبەست نەوەی ئادەمەو هاتنە دنیاو بینینی ئەو هەمو دروستکراوە جۆراوجۆرانە، کە بەڵگەن لەسەر پەروەردگاریی‌و خاوەنییەتی‌و پەرستراوی راستەقینە کە خوایە، مانای دووهەمیان ئەوەیە کە کاتی خۆی خوا کە ئادەمی دروستکرد لەپشتی ئادەم هەرچی نەوەی هەیە وەکو زیندەوەرێکی زۆر ورد بوە لە پشتی ئادەمدا دەرهێناوەو پێی فەرمون: ﴿أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ﴾ ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ ﴿قَالُواْ بَلَىٰ﴾ وتیان: بەڵێ، تۆ پەروەردگاری ئێمەیت، جا خوا فەرموی بۆیە ئەمەتان ئێستا پێ دەڵێم ﴿أَن تَقُولُواْ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ﴾ تا ئێوە لە رۆژی قیامەتدا نەڵێن ئێمە لەمە بێ ئاگایین‌و هیچمان پێ نەوتراوە.

(١٧٣) یان بڵێن: هەرباب‌و باپیرانمان بون لە پێشەوە کەهاوبەشیان داناوە بۆ خواوئێمە نەوەی ئەوانین‌و پاش ئەوان هاتوین‌و پەیڕەویمان کردون ئایا تۆ لەناومان دەبەیت‌و سزامان دەدەیت بەئیشێ کەلەسەرەتادا بەتاڵ کاران کردویانە؟ لەم بارەوە چەندین فەرمودەی راست هەیە لەوانە فەرمودەی{ **مَا مِنْ مَوْلُودٍ إلا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ/البخارى/** هەرمناڵێك کەلە دایك دەبێ لەسەر بیرو رایەکی پاك‌و راست پەیدا دەبێت بەڵام لەپاشا باوك‌و دایکیان دەیکەن بەجولەکە یان فەلە یان ئاگرپەرست}

هەروەها پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:خوای باڵا دەست دەفەرموێ: { **وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمْ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ وَحَرَّمَتْ عَلَيْهِمْ مَا أَحْلَلْتُ لَهُمْ** /مسلم/ خوا دەفەرموێ: من بەندەکانی خۆمم لەسەر بیرورایەکی پاك‌و دور لە شیرك دروستکردوە پاشان شەیتانەکان هاتن‌و لایان دان لە ئاینەکانیان‌و حەرامی کرد لێیان ئەوەی کەمن حەلاڵم کردبو بۆیان }

هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {بە پیاوێك کە لەناو ئاگری دۆزەخ دایە لەرۆژی قیامەتدا دەوترێت ئایا ئەگەر ئەو هەمو سەروەت‌و سامانەی سەر دنیا هی تۆ بوایە دەتدا بۆئەوەی کە ئەمڕۆ لەم ئاگرە رزگارت بێ؟ کابرا دەڵێ:بەڵێ، خوا دەفەرموێ: من شتێکی زۆر ئاسان تر لەوەم داواکرد لە تۆ، من پەیمانم لەتۆ وەرگرت کاتێ کەلە پشتی ئادەم دا بویت کە هیچ هاوبەشم بۆ دانەنێیت بەڵام تۆ ئەوەت پەسەند نەکردو هاوبەشت بۆدانام} وەلە فەرمودەیەکی تردا کە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا بۆمان باس دەکات‌و دەڵێت: ئیبنو عەباس لە پێغەمبەرەوەﷺ دەیگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: {**أَخَذَ اللَّهُ الْمِيثَاقَ مِنْ ظَهْرِ آدَمَ بِنَعْمَانَ يَعْنِي عَرَفَةَ فَأَخْرَجَ مِنْ صُلْبِهِ كُلَّ ذُرِّيَّةٍ ذَرَأَهَا فَنَثَرَهُمْ بَيْنَ يَدَيْهِ كَالذَّرِّ ثُمَّ كَلَّمَهُمْ قِبَلًا قَالَ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ قَالُوا بَلَى شَهِدْنَا أَنْ تَقُولُوا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَذَا غَافِلِينَ أَوْ تَقُولُوا إِنَّمَا أَشْرَكَ آبَاؤُنَا مِنْ قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِنْ بَعْدِهِمْ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ الْمُبْطِلُونَ** / أ د، صحح الألبا / بەراستی الله پەیمانی وەرگرت لەپشتی ئادەم کاتێ کەئادەم لە عەرەفات بو هەمو ئەوانەی کە پەیدا دەبن لەئادەم دەریهێناو لەپێش دەستیا بڵاوی کردەوە، ئینجا روبەڕوقسەی لەگەڵدا کردن‌و فەرموی: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟ وتیان: بەڵێ، تۆ پەروەردگاری ئێمەیت، شایەتی دەدەین ، جا ئەوەمان بۆیەکرد تا لەقیامەتدا نەڵێن: ئێمە بێ ئاگابوین لە ناسینی تۆو یەکخواناسی یان بڵێن: هەرباب‌و باپیرانمان بون لە

پێشەوە کەھاوبەشیان داناوە بۆ خواو ئێمە نەوەی ئەوانین‌و پاش ئەوان ھاتوین‌و پەیڕەویمان کردوون ئایا تۆ لەناومان دەبەیت‌و سزامان دەدەیت بەئیشێ کەلەسەرەتادا بەتاڵ کاران کردویانە؟ جا کۆی ئەم فەرمودانە ئەوە دەسەلمێنێ کە ئەم پەیمانە پەیمانێکی گفتوگۆو قسەکردن بووە نە پەیمانێکی حاڵ‌و بارو دۆخ‌و بەڵگەو نیشانەبێت وەك مانای پێشوو دەیگەیاند، واتە ھەمو بنیامێك راستەوخۆ خۆی بەرپرسیارە سەبارەت بەیەکخواناسی‌و پەیڕەوی ئەم‌و ئەوو ھیچ سودێکی پێ نادات ، بەڵکو دەبێ بەئارەزوی خۆی یەکخواناسی ھەڵبژێرێ‌و پەیڕەوی لەو پەیمانەی پشتی ئادەمی باوەکە گەورەی خۆی بکات، بەوشێوەی کەبەزمانی پێغەمبەرەوەﷺ ھاتوە ، ئەگینا شایستەی سزاو رقی خوایە.

جا دەفەرموێ: ئەوەمان پێ وتن تا لە رۆژی قیامەتدا نەڵێن: ئێمە بێ ئاگابوین لە ناسینی تۆو یەکخواناسی یان بڵێن: ھەرباب‌و باپیرانمان بون لە پێشەوە کەھاوبەشیان داناوە بۆ خواو ئێمە نەوەی ئەوانین‌و پاش ئەوان ھاتوین‌و پەیڕەویمان کردون ئایا تۆ لەناومان دەبەیت‌و سزامان دەدەیت بەئیشێ کەلەسەرەتادا بەتاڵکاران کردویانە؟ ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٧٤) ھەر ئابەو شێوەیە ئێمە نیشانەکان رۆشن دەکەینەوە بەڵکو ئەوانیش لە خراپەو تاوان بگەڕێنەوەو رێگای راستەقینە بگرنەبەر. ئینجا خوا باسی زانایەکی خواناسمان بۆ دەکات کەلەبەر دنیاو خۆشی دنیا وازی لە ئاینەکەی خۆی‌وراستی ھێناو پەیڕەوی لە ئارەزوو شەیتان کردو دەفەرموێ:

(١٧٥) ئەی محمدﷺ بخوێنەرەوە بۆئەوان ھەواڵی ئەوکەسەی کە ئێمە نیشانەکانی خۆمانمان پێدابوو شارەزاییەکی چاکی ھەبو بەڵام خۆی دارنی لەوەی کە ئێمە پێمان دابو ، بەگوێی فەرمانەکانی خوای نەکردو بۆ خۆش گوزەرانیەکی کەم ژیانێکی ھەمیشەیی خۆی لەدەست دا ، جا وای لێ ھات کەشەیتان پەیڕەوی دەکرد ، واتە لە خراپیدا بو بە مامۆستای شەیتان ، وەدەشگونجێ کەشەیتان دوایی کەوتو وەك حەیوانێك بەم لاولادا دەیبردو ئەوزانا پایەبەرزە بەو تاوانە کەوتە ژێردەستی شەیتان ، دەڵێن ئەم زانایە ناوی بلعام یان بەلعەمی کوڕی باعورا بووەو ناوەجوانترەکان‌و گەورەترەکانی خوای(اسم الله الاعظم)ی زانیوەو ھەردوعایەکی بکردایە وەر دەگیرا بەڵام کاتێ موسا بەرەوشام چوو خزمەکانی چونەلای‌و وتیان: ئەوە موساو گەلەکەیەتی‌و دەیەوێ لێرە دەرمان بکات‌و گەلەکەی خۆی سەقامگیربکات دەبێ دوعا بکەیت بەڵکو لەناوچێت ئەویش وتی: ئەوە پێغەمبەری خوایە نابێ دوعای لێ بکەم ئەگەر دوعایشی لێ بکەم وەرناگیرێت ، بەڵام خزمەکانی بەلۆمەو بە بەرتیل وازیان لێ نەھێناو ئەوسا

ئەویش کە خزمەکانی خۆی لەگەڵدا بو چوە شوێنێك لەبەرامبەری موسا و گەلەکەیەوەو دەستی کرد بەدوعاکردن جا ھەرچی دوعای شەڕی لەموسا دەکرد زمانی بەخەیر دەسوڕاو ھەرچی دوعای خێری بۆ خزمانی دەکرد زمانی بەشەڕ دەسوڕاو خزمەکانی وتیان: تۆ بە پێچەوانەوە دوعا دەکەیت؟! ئەویش وتی: بەدەست خۆم نیەو زمانم ھەر ئەوە دەھێنێ ، ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(١٧٦) ئەگەر ئێمە ئارەزۆمان لێبوایە بەراستی بەھۆی ئەو نیشانانەی کە خۆمان پێمان دابو بەرزمان دەکردەوە بەڵام باوی خوا وانیە کەکەس بەزۆر باوەڕدار یان بێ باوەڕبکات بەڵکو خوا بنیامی سەرپشك کردوە کەبەئارەزۆی خۆی بێ کە کام رێگا ھەڵبژێرێت ، چاك یان خراپ ، کامیان ھەڵبژێرێت خوا یارمەتی دەدات وەك لێرەش فەرموی: ئەو خۆی لەوانەبو کە خراپەیان دەویست، کەوابو چونکە خۆی نەیویست خوایش بەرزی نەکردەوە بەڵکو ئەو وەك مرۆڤێکی پەستو بێ نرخ لەم سەرزەوییەداماێەوەو دوای ئارەزۆکانی کەوت کە وێنەی ئەم زانایە وەك وێنەی سەگ وایە کە ئەگەر راوی نێیت‌و بیفرێنی زمان دەردەھێنێ‌و ئەگەر وازیشی لێ بھێنی ئەو ھەر لەبەر ھەناسە تەنگی زمان دەر دەھێنێ جا ئەم زانایەیش بەم رەفتارەی کەکردی وەك ئەو سەگەیە لە قسەو گفتو گۆدا ھیچ کەمی نیە بەڵام ھەرماندو بونی بۆ دەمێنێتەوە جا ئەوەنەبێ ئەم بەسەر ھاتە ھەر تایبەتی ئەو زانا بێ بەڵکو بۆ ھەر زاناو گەلێکە لەھەرسەردەمێکدا کەبەگوێی ئایین‌و بەرنامەی ﷲ نەکاتو پاڵ پشتی خراپەکاران بێ‌و دژی چاکەکاران وەك دەفەرموێ: ئائەمە وێنەی ھەرگەلێکە کە بێ باوەڕبێ بە نیشانەکانی ئێمە ، بۆیە خوا بە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: ئەی محمد تۆ ئەو داستانە باس بکە بۆگەلەکەت بەڵکو ئەوانیش بیر بکەنەوەو خۆیان وەك ئەو زانایە لێ نەکەن، بەراستی ئەمە وانەیەکی زۆر گرنگەو پێویستە زانایان چاك بیری لێ بکەنەوەو ترازویەکەوخۆیانی پێدا بکێشن‌و خۆیان‌و دەوروبەری خۆیشیان بەچاکی پێ بناسن‌و بزانن ئایا پەیامەکەی خوا رادەگەیەنن‌و سڵ لە ھیچ ناکەن یان ئەوانەن کەبۆدەسکەوتێکی کەمی دنیا راستیەکان دەشارنەوەو خراپەی خراپەکاران پاساو دەدەن‌و دەستخۆشی‌و پیرۆز باییان لێ دەکەن؟ ئەی زانایان بیر بکەنەوەو بترسن لە خوا، خوا ھیچی لێ شاراوەنیە ، لەم بارەوە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: (إن ا أ وفُ عليكُم رجلٌ قرأ القرآنَ ، حتى إذا رُؤَيتْ بجتُه عليهِ و كانَ رِدءُ الإسلامِ اعتراهُ إ ما شاءَ ا ُ : انسلخَ منهُ ونبذَ وراءَ ظهره، وسعى على جاره بالسيفِ، ورماهُ بالشركِ قالَ قلتُ: يا ن ا ِ ، أيهُما أو بالشركِ ؛ ا ْرِمي أو الرامي؟ قال: بلِ الرامي/ السلسلة الصحيحة، حسنه

**الالبا** / بەراستی هەندێ لەوانەی کە من زۆر لێی دەترسم لەناو ئێوەدا پیاوێکە کە قورئانی خوێندوە بە شێوەیەك کە ئەو قورئانە جوانو رەنگینی کردوەو بەسەرو سیمایدا ئەدرەوشێتەوە ئەو پشتیوانی ئیسلام بوەو یارمەتی داوە تا ئەو کاتەی خوا ئارەزۆی لێ بوە ئینجا خۆی کێشاوەتەوەو ئایینەکەی خستوەتە پشتگوێیەوەو پەلاماری هاوسێکەی بە شمشێر داوەو بەموشریکی داناوە، حوزەیفە کە ئەم فەرمودەیە دەگێڕێتەوە. دەڵێ وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەو دوانە کامیان نزیکترن لە شیرکەوە تاوانبارکراو یان تاوانبارکەر فەرموی: تاوانبارکەر}

بەڵێ، بەراستی ئیشێکی خراپو تاوانێکی گەورەیە پشتگوێ خستنی ئاینی خوا. لێرەش دەفەرموێ:

(١٧٧) ناشیرینو خراپە وێنەی ئەوگەلەی کە بێ باوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە. جا ئەوەتە خوا وێنەی ئەو جۆرە بێ باوەڕانەی بەسەگو بە گوێدرێژی چواندوە وەکو لێرەولە سورەتی "الجمعە" ئایەتی پێنجداهاتوە. جا تەماشا بکەنو بزانن کە پیسترین گیان لەبەر سەگەو بێ عەقڵترین حەیوان گوێدرێژە خوا کردویەتی بەوێنەی ئەوزانایانەی کە بەگوێی ئاینی خوا ناکەنوراستیەکان دەشارنەوە، جائەوە نەبێ کەخوا ستەم لەوان بکات بەڵکو ئەوان ستەمیان لە خۆیان کردوە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(١٧٨) ئەوکەسەی کە ﷲ ڕێنمای بکاتو هیدایەتی بدات هەر ئەوە ڕێگای راستی گرتوە، وەهەرکەسێکیشی گومڕا کرد ئەوسا هەر ئەوانن زیان لێکەوتوو رەنجەڕۆن.

پێویستە ئەوە بزانین کە خوا خاوەنی هێزەو هەرچیەك ئارەزۆبکات دەیکاتوکەس ناتوانێ ڕێگری لێ بکات بەڵام خوا خاوەنی سۆزوو بەزەییەکی زۆرو گەورەیەو ستەم لەکەس ناکاتو بنیامی کردوە بە سەرپشكو خۆی بۆ خۆی دەتوانێ ڕێگای چەوت یان راست هەڵبژێرێ ، لێرەدا مەبەست ئاشکرا کردنی دەسەڵاتی بێ سنوری خوایە نەك خوا بەزۆر خەڵك ڕێنمایی یان گومڕابکات وەلە راستیشدا بۆ ڕێنماییو بۆ خراپە خوایە یارمەتی دەری مرۆڤ ، کەواتە راستە لەو لایەنەوە بڵێین هەرخوایە ڕێنمایی دەکاتو گومڕاش دەکاتوهەردووکیان هەربەدەست ئەون بەڵام چونکە خۆی بۆ خۆی ڕێگای خراپەو چاکە هەڵدەبژێرێ ، تاوانی خراپەی لەسەر خۆیەتی هەروەها پاداشی چاکەیشی بۆخۆیەتی جا ئەوانەی کەئەم هەمو پەندو ئامۆژگارییە کاریان تێ نەکاتو بیر لە ئایندەی خۆیان نەکەنەوەو بۆ سودێکی کاتی پەیڕەوی نەفسو شەیتان بکەن بەراستی ئەوانە خۆیان لە مرۆڤایەتی دورخستوەتەوەو چونەتە ریزی ئاژەڵەوە بەڵکو لەئاژەڵیش کەمتر ، وەك دەفەرموێ:

وَلَقَدْ ذَرَأْنَا لِجَهَنَّمَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ ۖ لَهُمْ قُلُوبٌ لَّا يَفْقَهُونَ بِهَا وَلَهُمْ أَعْيُنٌ لَّا يُبْصِرُونَ بِهَا وَلَهُمْ ءَاذَانٌ لَّا يَسْمَعُونَ بِهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ كَٱلْأَنْعَٰمِ بَلْ هُمْ أَضَلُّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْغَٰفِلُونَ ﴿١٧٩﴾ وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾ وَمِمَّنْ خَلَقْنَآ أُمَّةٌ يَهْدُونَ بِٱلْحَقِّ وَبِهِۦ يَعْدِلُونَ ﴿١٨١﴾ وَٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا سَنَسْتَدْرِجُهُم مِّنْ حَيْثُ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٢﴾ وَأُمْلِى لَهُمْ ۚ إِنَّ كَيْدِى مَتِينٌ ﴿١٨٣﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا۟ ۗ مَا بِصَاحِبِهِم مِّن جِنَّةٍ ۚ إِنْ هُوَ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿١٨٤﴾ أَوَلَمْ يَنظُرُوا۟ فِى مَلَكُوتِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ وَأَنْ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَدِ ٱقْتَرَبَ أَجَلُهُمْ ۖ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿١٨٥﴾ مَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِىَ لَهُۥ ۚ وَيَذَرُهُمْ فِى طُغْيَٰنِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿١٨٦﴾ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرْسَىٰهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى ۖ لَا يُجَلِّيهَا لِوَقْتِهَآ إِلَّا هُوَ ۚ ثَقُلَتْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَا تَأْتِيكُمْ إِلَّا بَغْتَةً ۗ يَسْـَٔلُونَكَ كَأَنَّكَ حَفِىٌّ عَنْهَا ۖ قُلْ إِنَّمَا عِلْمُهَا عِندَ ٱللَّهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٨٧﴾

(١٧٩) خۆ بەراستی ئێمە زۆرێك لە جنۆکەو ئینسانمان بۆ دۆزەخ دروستکردوە چونکە ئەو دوو دروستکراوە زۆربەیان ڕێبازی ناپەسەندو خراپ هەڵدەبژێرنو ئایندەیان دۆزەخ دەبێ ، وەخوا ستەم لەکەس ناکاتو کەسیش بەزۆر بەرەو خراپەنابات بەڵکو هەمو هۆیەکی ڕێگا دۆزینەوەیان پێ دەدات ، ئەوان دڵیان هەیە بەڵام هیچ وەرناگرنو چاویان هەیە بەڵام لەوهەمو بەڵگەو نیشانانەی بوونەوەر سود وەرناگرنو ئەوان گوێیان هەیە بەڵام هیچ شتێکی باشی پێ نابیسن، واتە سێ شت پاش پەیامی پەیامبەران هەیە کەببێ بەهۆی زانایی‌و ڕێنمایی مرۆڤ ئێمە ئەو سێ شتەمان پێداون ، ژیری کەبەدڵ ناوی بردوەو چاوو گوێ بەڵام ئەوان لەهیچ کامیان سودێکیان وەرنەگرتوە بەڵکو وەك چوارپێ تەنها مەبەستیان خەوو خواردن بوەو هیچی تر ، بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەمانە وەك چوارپێ وانە هیچ شتێك کاریان تێ ناکاتو سود لەو هەمو بەڵگانە وەرناگرن ، ئەگەر چی هەندێ لە چوارپێیان خاوەنی خۆیان دەناسن بەڵام ئەم کۆمەڵە زۆرەی جنۆکەو ئینسان خاوەنی خۆیشیان ناناسن بەڵکو ئەوان لە چوار پێکانیش گومڕاو سەرلێ شێواو بێ ئاگاترن ئائەوانە هەرخۆیانن بێ ئاگان کە بۆ شتانێکی کەمو بێ نرخی دنیایی پاشە رۆژێکی درێژو ژیانێکی هەمیشەیی لەدەستخۆیان دەدەن. لەپاش ئەوەی کە تێیگەیاندین کە زۆربەی ئەو دوو دروستکراوە بۆ دۆزەخ دەبن ، ئەوسا ئیترجێگای خۆیەتی کە پێرە کەمو باشەکە چاکتر خوای

خۆیان بناسن‌و بزانن چۆن داواکارییەکەی خۆیان پێشکەش بەزاتی بێ نیازی پەروەردگاری عالەم بکەن وەك لێرەدا دەفەرموێ:

(١٨٠) بۆخوا چەندین ناوی شیرین ترو جوانتر هەیە دەی بەو ناوانە بپاڕێنەوە لەئەو خوا بەشکۆیە کەخاوەنی ناوی زۆرە لەوانەش زۆربەیان لە قورئان‌و فەرمودەدا باسکراون نزیکەی هەزار ناوێك لەلایەن زانایانەوە تۆمارکراوەوە ئێمەش لەم بارەوە لە نامیلکەی(ا اء ا ا س ) دا دووسەدوپەنجاوشەش ناومان تۆمارکردووە مانای دووسەدو سی‌و حەوت ناومان کردووە خوێندنەوەی سودی دەبێ لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە کە { لِلهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ اسْمًا مَنْ أَحْصَاهَا دَخَلَ الْجَنةَ وَإِن اللهَ وِتْرٌ يُحِبُ الْوِتْرَ /متفق علیه/بەراستی خوا نەوەدو نۆ ناوی هەیە، سەد یەکێکی کەمە هەرکەسێك ئەو نەوەدو نۆ ناوانە بژمێرێ‌و باوەڕی پێیان هەبێ‌و لە کرداریدا رەنگ بداتەوە دەچێتە بەهەشتەوە ، ئەوزاتە تاکەو تاکی پێ خۆشە}

مەبەست ئەوەنیە کە خوا تەنها نەوەدو نۆ ناوی هەیە بەڵکو مەبەست ئەوەیە کەنەوەدو نۆ ناو لەو ناوانەی خوا لەبەر کردن‌و مانا زانینی‌و بەگوێ کردنی دەبێ بەهۆی ئەو دەسکەوتە گەورەیە، لێرەش وادەر دەکەوێ کە خوا دوو جۆرە ناوی هەبێ جۆرێکیان ناوی شیرین‌و جوانەوجۆرێکی تری شیرینترو جوانترە ، جا چونکە فەرمودەیەکی راستی کۆکەرەوەی ناوەکان نەهاتوە ئەگەر چی - ترمزی - فەرمودەیەکی هێناوەو نەوەدو نۆ ناوی نوسیوە بەڵام ناتوانرێت هەر ئەوە بەناوە جوانترکان دابنرێت چونکە ناوی خوا زۆرەو وەك لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە کە دەفەرموێ:{ مَا قَالَ عَبْدٌ قط إذَا أَصَابَهُ هَم وَحَزَنٌ اللهُم إني عَبْدُكَ وَابْنُ عَبْدِكَ وَابْنُ أَمَتِكَ نَاصِيَتِي بِيَدِكَ مَاضٍ حُكْمُكَ عَدْلٌ فِي قَضَاؤُكَ أَسْأَلُكَ بِكُل اسْمٍ هُوَ لَكَ سَمَّيْتَ بِهِ نَفْسَكَ أَوْ أَنْزَلْتَهُ فِي كِتَابِكَ أَوْ عَلَّمْتَهُ أَحَدًا مِنْ خَلْقِكَ أَوْ اسْتَأْثَرْتَ بِهِ فِي عِلْمِ الْغَيْبِ عِنْدَكَ أَنْ تَجْعَلَ الْقُرْآنَ رَبِيعَ قَلْبِي وَنُورَ صَدْرِي وَجِلَاءَ حُزْنِي وَذَهَابَ هَمِي إِلَّا أَذْهَبَ اللهُ عَز وَجَل هَمَّهُ وَأَبْدَلَهُ مَكَانَ حُزْنِهِ فَرَحًا قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ يَنْبَغِي لَنَا أَنْ نَتَعَلمَ هَؤُلَاءِ الْكَلِمَاتِ قَالَ أَجَلْ يَنْبَغِي لِمَنْ سَمِعَهُنَّ أَنْ يَتَعَلمَهُنَّ / ا د، صححه الالبا / هیچ کەسێك دوچاری دڵتەنگی‌و خەفەتێك نابێ‌و بڵێ: ئەی خوایە من بەندەی تۆم‌و کوڕی بەندەی تۆم کوڕی ئافرەتێکم کە بەندەی تۆیە ناوچاوانم بەدەست تۆیە فەرمانی تۆ لەبارەی منەوە جێ بەجێ کراوە ، داد پەروەرانەیە بڕیاری تۆ لەبارەی منەوە ، من داوات لێ دەکەم بەهەمو ناوێك کە خۆت بۆ خۆتت داناوە یان کەسێکت فێرکردوە یان رەوانەت کردوە لە پەڕاوەکەت دا یان تەنها خۆت دەیزانی‌و لای خۆتە ئەم قورئانە بکەیت بەبهاری دڵم‌و بیکەیت بەروناکی سینگم‌و بەپاك کردنەوەی خەفەتەکەم‌و لابردنی دڵ تەنگیەکەم. هەرکەسێ وای وت اللّٰه ئەو دڵتەنگی‌و خەفەتەی لادەبات‌و دەیگۆڕێتەوە بەخۆشی بۆی ، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئایا فێری ئەمانە نەبین؟ فەرموی بەڵێ: پێویستە لەسەر هەرکەسێك کەبیستی فێری ببێت}

جا لەم فەرمودەوە دەردەکەوێت کە ناوەکانی خوا زۆرن‌و لەوانە هەندێکیان لە هەندێکی تریان جوانترە بەڵام ئەوانە دیاری نەکراون تا هەمو ناوەکانی خوا بزانرێت ، ئینجا اللّٰه دەفەرموێ: وازبێنە لەو کەسانەی کەوا لادەدەن لە ناوەکانی خواوبەشێوەی خۆی مانای ناکەن‌و بەشێوەی ناتەواو بۆ غەیری خوای بەکاری دەهێنن وەك بت پەرستان لە وشەی (اللّٰه) اللاتیان دروستکرد وەهەروەها لە (العزیز، المنان)عوززاو مەناتیان دروستکردبو بەوشێوەیە بون بەهاوڵ دانەر بۆ خوا جا خوا داوا لە موسڵمانان دەکات کە ناوە جوانترەکانی خوا بکەن بەویردی زمانیان‌و مانایان بەوشێوەیە نەکەن کەنەگونجێت لەگەڵ زاتی خودادا، ئینجا اللّٰه دەفەرموێ: بەم زووانە پاداشتی ئەو کارە ناپەسەندەیان وەر دەگرن.

(١٨١) خۆڵەوانەی کە ئێمە دروستمانکردوە گەلێك هەیە کە پەیڕەوی راستی دەکات بەقسەو بەکردارو خەڵکیشی بۆ بانگ دەکەن‌و هەر بەو راستیەش ئیش دەکەن و بڕیار دەدەن، لە فەرمودەی پێغەمبەرمان ﷺ دا هاتوە کە دەفەرموێ: { لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمتِي ظَاهِرِينَ عَلَى الْحَق لَا يَضُرُّهُمْ مَنْ خَالَفَهُمْ وفي رواية حَتى يَأْتِيَ أَمْرُ اللهِ وَهُمْ كَذَلِكَ _وفي رواية_وهم بالشام/ متفق علیه/ بەردەوام کۆمەڵێك لەم گەلەی من بەئاشکرا لەسەر حەق دەبن هیچ زیانیکیان پێ ناگەیەنێ ئەوکەسەی کەدەیەوێ دژایەتیان بکات هەتا قیامەت دێت . _وەلە ریوایەتێکی تردا_ هەتا فەرمانی خوادێت ئەوان بەشێوەن. _ وەلەریوایەتێکی تردا_ وەئەوانەلەشامن} ئینجا اللّٰه باسی ئەوکەسانە دەکات کە تاوان‌و خراپەدەکەن بەڵام وەزعی ژیانیان خۆش دەبێ‌و دەفەرموێ:

(١٨٢) ئەوانەی کە بێ باوەڕبون بەنیشانەکانی ئێمە کەم کەم‌و پلە بەپلە بەرزیان دەکەینەوەو ژیانیان خۆش دەکەین‌و هەندێ لە ئاواتەکانیان بۆ دێنینەجێ لەپاشدا تۆڵەیان لێدەسێنین بەشێوەیەك کە خۆیان نایزانن. وەکو لە فەرمودەی پێغەمبەرا ﷺ هاتوە کەدەفەرموێ:{ئەگەر بینیتان ئینسانێ گوناهی کردو لەگەڵ ئەوەشدا اللّٰه نیعمەتی بەسەردا دەڕژاند بزانن کە ئەوە(استدراجە) خوا گەرەکیەتی بەرزی بکاتەوەو پاشان بەسەختی بەزەویدا بدات}

ئاشکرایە ئینسان تالە جێگای بەرزتر بکەوێتە خوارەوە زیانی زۆرتری پێ دەگات، خوا تاوانباران‌و ستەمکاران زۆر زۆر بەرزئەکاتەوەو لە پاشان ئەیانخێت کە ئیتر لە ناو چونینان مسۆگەرە وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{إنَ ا - لُيمِلي ِللظاِلم حَتى إذَا أخَذهُ لَم ُيفِلتهُ/متفق عليه/بەبێگومان کە خوا ماوە بەستەمکاران دەدات تا چی لە توانایدایە بەکاری بهێنێ_تاباری قورستربێ بۆ پاشە رۆژ_ جاماوەی پێ دەدات تا ئەوکاتەی کە کاتی تۆڵەسەندنەوەی دێت کە هەرکات گرتی تازە رزگاری ناکات و لێرەش دەفەرموێ:

(١٨٣) ئەی محمدﷺ مۆڵەتم پێ بدە بۆیان بەراستی ئیشی من دژی ئەوان‌و تۆڵە لێ کردنەوەیان زۆر بەهێزو توندە ، بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە لە ستەمکاران واتە ئەی خاوەن باوەڕ دڵتەنگ نەبی بەستەمکاران‌و دەسەڵات‌و هێزیان ئەوەشتێکە خۆم ئەمەوێ دەستیان لێ شل بکەم تا بۆ خۆیان‌و هەمو خەڵکیش دەرکەوێت پیسی‌و لاساری ئەوان‌و پاشان هێزو حەوسەڵەی ئێمە. وشەی (کید)کە لێرە هەیە (مکر وخدعە) بۆ خوا ، نابێ بەو مانایەی کە بۆ خەڵك مانا دەکرێت بۆ خوایش وا مانا بکرێت، لەراستیدا خەڵکی بۆیە فرو فێڵ دەکات توانای نیە بەئاشکرا ئەو کارە ئەنجام بدات‌و لە تۆڵە سەندنەوە دەترسێت بەلاّم خوا وانیەو لە هەمو کەس بەهێزترەو لە تۆڵەی کەسیش ناترسێت، بەلاّم چونکە (مکر، کید، خدعە ، حیلە)بەو ئیشە دەڵێن کەلە پشتی پەردەوە ئەنجام دەدرێت‌و کابرا بەخۆی نازانێ تا رودەدات بۆی، لەم بارەوە ئیشەکانی خوا کەس پێی نازانێ تارودەدات کەواتە شێوەکەی لە(کید)ی خەڵك دەچێت ئەگینا ناوەڕۆکەکەی جیایە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(١٨٤) ئایا ئەو بێ باوەڕانە بیر ناکەنەوە کە ئەو رەفیقەی ئەوان واتەمحمدﷺ هیچ شێوە شێتیەکی پێوە نیە؟ ئەو نیە بێجگە لە ترسێنەرێکی ئاشکراو رون . دەڵێن : پێغەمبەرمانﷺ لەسەر کێوی "ئەبو قوبەیسە" وە، بانگی کردە قورەیش تیرە بەتیرەو ناوی تیرەکانی بردو ترساندنی لە سزاو تۆڵەی خوا لەو کاتەدا یەکێکیان وتی: بەراستی ئەم رەفیقەی ئێوە شێتەو هەر لە شەوەوە تابەیانی بانگ دەکات ، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە بۆدەمکوتی ئەو تاوانبارەو وێنەکانی تا قیامەت، ئینجا ﷲ سرنجی باوەڕداران بەرەو بونەوەر رادەکێشێ تا بەڵکو بیر بکەنەوەو خوای خۆیان بدۆزنەوەو پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ بکەن‌و دەفەرموێ:

(١٨٥) ئایا ئەوان تەماشای ئەو هەمو موڵکەی ئاسمانان‌و زەوییان نەکردوەو ئەو هەمو شتەی کە خوا دروستی کردوە؟ وەبیر ناکەنەوە لەوەی کە کاتی مردنیان نزیك بوبێتەوە؟ جا پاش ئەم قسانەی ﷲ ئیتر ئێوە باوەڕ بەچ قسەیەکی تر دکەن؟ واتە پێویستە مرۆڤی ژیرو زانا بەپەلە سود لە نیشانەکان وەرگرێت‌و لە دڵ‌و دەرون‌و وتارو کرداریدا رەنگ بداتەوە، نەوەك لەناکاودا بمرێ‌و ئەم ژیانەی لە دەست بچێت‌و بەدەستی خاڵی بۆ ئەو دنیاکەی تری بڕوات، ئەمەش بەڵگەی سۆزو میهرەبانی لە سنوربەدەری پەروەردگارمانە کەبەم شێوەیە ئامۆژگاریمان ئەکات تا سودلەم ژیانەوەربگرین‌و لەو رۆژە سەخت‌و پڕ مەترسیە رزگارببین. ئینجا دەفەرموێ:

(١٨٦) ئەوکەسەی کەوا خۆی ئیشی خراپە دەکات‌و دەبێ بەهۆی ئەوەی کەﷲ گومڕاهی بکا ئەوسا مادام ﷲ گومڕاهی کرد هیچ کەسێکی تر ناتوانێت بیخاتە سەر ڕێگای راست‌و وازیان لێ دەهێنێ تا ئەوان هەر لەو بێ ئاگاییەی خۆیانەدا زۆر بچنە خوارەوەو هەر خەریکی ئەو ئیشە خراپانەی خۆیان بن . ئەمە بۆ ترساندن‌و هەڕەشەکردنە لێیان واتە ئێمە هیچ نیازێکمان بەوان نیەو موحتاجیان نین‌و ناترسین لێیان بەڵکو مرۆڤ پێویستی بە ئێمە هەیەو دەبێ بێتەوە بەردەم دادگامان‌و چەندو چونی لەگەڵدا بکەین. پاشان دەفەرموێ:

(١٨٧) پرسیار دەکەن لەتۆ ئەی محمدﷺ لەبارەی رۆژی قیامەتەوە دەڵێن: کەی دێت؟ بزانە کەئەم ناوانە بەمانای قیامەتن(الساعة، القارعة، الطامة، الصاخة، يوم ا مع، يوم التغابن، يوم الازفة، الواقعة، يوم التناد، القيامة، يوم الاخرة، يوم التلاق) پێیان بڵێ زانینی کاتی هاتنی قیامەت تەنها لەلای پەروەردگارمە کەکاتی هاتنی دیاری ورۆشن نەکردوەتەو واتە بێجگەلە خوا کەس ناتوانێت کاتی هاتنی رۆژی قیامەت دیاری بکات چونکە هەر خۆی دەزانێ‌و پێغەمبەرانی لەکاتی هاتنی ئاگادار نەکردوەتەوەو هەرچی لەم بارەوە بوترێت گومانە ، بەڵێ، پێغەمبەران زۆرێك لە نیشانەکانی هاتنی قیامەتیان پێ وتراوە بەتایبەت پێغەمبەری خۆمانﷺ ئەوەتە لە چەندین فەرمودەدا باسی کردون. بارێکی گرانە لەسەر ئاسمانان‌و زەوی چونکە هەمویان بەهاتنی ئەورۆژە دوچاری سەختی‌و نەمان‌و گۆڕان دەبن، کە قیامەت هات ئاسمان لەت دەبێت‌و ئەستێرەکان ڕێزاڵ ڕێزاڵ دەبن‌و رۆژ ئەپێچرێتەوەو چیاکان دەبن بەتۆزو با بەم لاو بەو لایاندا دەباو دەریاکان دەتەقنەوەو دەسوتێن‌و هەمو گیان لەبەرێك ئەمرێت ، لەراستیدا بارێکی گرانە لەسەر ئاسمان‌و زەوی‌و هیچ دروستکراوێکی خوا لە هاتنی ئەو رۆژەبێ زیان نابێ ، کاتی هاتنەکەیشی لەنا کاودا دەبێ وەك دەفەرموێ: نایەتەلاتان ئەو رۆژە مەگەر زۆر لە ناکاودا ، پرسیار دەکەن لەتۆ ئەی محمدﷺ وەکو ئەوەی کەوا تۆ زانایيت

قُل لَّآ أَمۡلِكُ لِنَفۡسِي نَفۡعٗا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ وَلَوۡ كُنتُ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ لَٱسۡتَكۡثَرۡتُ مِنَ ٱلۡخَيۡرِ وَمَا مَسَّنِيَ ٱلسُّوٓءُۚ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ وَبَشِيرٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١٨٨﴾ ۞ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَجَعَلَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا لِيَسۡكُنَ إِلَيۡهَاۖ فَلَمَّا تَغَشَّىٰهَا حَمَلَتۡ حَمۡلًا خَفِيفٗا فَمَرَّتۡ بِهِۦۖ فَلَمَّآ أَثۡقَلَت دَّعَوَا ٱللَّهَ رَبَّهُمَا لَئِنۡ ءَاتَيۡتَنَا صَٰلِحٗا لَّنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٨٩﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُمَا صَٰلِحٗا جَعَلَا لَهُۥ شُرَكَآءَ فِيمَآ ءَاتَىٰهُمَاۚ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿١٩٠﴾ أَيُشۡرِكُونَ مَا لَا يَخۡلُقُ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿١٩١﴾ وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ لَهُمۡ نَصۡرٗا وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٢﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَتَّبِعُوكُمۡۚ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡ أَدَعَوۡتُمُوهُمۡ أَمۡ أَنتُمۡ صَٰمِتُونَ ﴿١٩٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ عِبَادٌ أَمۡثَالُكُمۡۖ فَٱدۡعُوهُمۡ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٩٤﴾ أَلَهُمۡ أَرۡجُلٞ يَمۡشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَيۡدٖ يَبۡطِشُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ أَعۡيُنٞ يُبۡصِرُونَ بِهَآۖ أَمۡ لَهُمۡ ءَاذَانٞ يَسۡمَعُونَ بِهَاۗ قُلِ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ كِيدُونِ فَلَا تُنظِرُونِ ﴿١٩٥﴾

هەبێ لەبارەی رۆژی هاتنیەوەو وادەزانن کە تۆ دەزانی بەڵام بەوان ناڵێیت ، وەکو لە هەندێ ریوایەتدا هاتوە کە قورەیشەکان دەچونە نزیکی پێغەمبەرەوەﷺ بەچپە پێیان دەوت تۆ دەزانی کەی دیت ئێمە خزمو خوێشی تۆین پێمان بڵێ، خوایش دەفەرموێ: بڵێ ، بەراستی زانینی کاتی هاتنی قیامەت تەنها لەلای خوایەو کەسی تر بەڵام زۆربەی خەڵك ئەم راستیە نازانن بەڵکو هەردەیانەوێ بەقسە خۆیان خەریك بکەن. لە فەرمودەی بەناو بانگی جوبرەئیلدا پرسیاری هاتنی رۆژی قیامەت لە پێغەمبەرمانﷺ دەکاتو پێغەمبەرمانﷺ فەرموی:{ مَا المَسْئُولُ عَنْهَا بِأَعْلَمَ مِنْ السائِلِ /البخاری/ پرسیار لێ کراو لەبارەی کاتی هاتنی رۆژی قیامەتەوە لە پرسیارکەر زاناتر نیە} واتە منیش هەروەکو تۆم لەم بارەوەو نایزانم.

(١٨٨) پێیان بڵێ: بەراستی من بۆ نەفسی خۆم هیچ سودو زیانێکم بەدەست نیە مەگەر خوا خۆی ئارەزۆ بکات ئیتر دەبێ بۆ خەڵکی تر چۆن بێ؟ پێویستە بزانین کە زانینی هەموشت ئەرکی سەرشانی پێغەمبەران نەبوە بەڵکو زانینی فەرمانە شەرعیەکان بەتەواوی ئەرکی سەرشانیان بوە ، تەماشای داستانی موساو رەفیقەکەی بکەن لە سورەتی (الکهف)داو داستانی بوختیانی دووڕووەکان سەبارەت بەخێزانە پاکەکەی پێغەمبەرمانﷺ ء ناڕەحەت بونی پێغەمبەر تاوەحی بۆهاتو بردنی هەدی بۆ حەج کە فەرموی: ئەگەر ئەوەی ئێستە زانیم لە پێشەوە بمزانیایە {لَمَا سُقتُ الهَدي/ هەدییم لەگەڵ خۆمدا نەدەهێنا} وەدەیان روداوی تر کەئەوە دەسەلمێنێ کە پێغەمبەرانیش توانای هیچ سودو زیانێکیان نیە تا خوا ئارەزۆ نەکات کە ئەمە دەبێ ئامۆژگارییەکی زۆربەسود بێ بۆ ئەو نەزانانەی کە چاوەڕوانی سودو زیان لە خەڵکی وەك خۆیانەوە دەکەنو دەچنە سەر قەبرو داوای کوڕو ماڵو شیفایان لێ دەکەن؟! ئینجا خوا بە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: بەو بێ باوەڕانە بڵێ: ئەگەر نهێنیم بزانیایە زۆر ئیشی باشم دەکرد بۆ خۆمو وەهەرگیز بەڵاو موسیبەتم دوچار نەدەبو چونکە دەم زانی کامە خەیرە زوو دەم کردو کامەش شەڕە زوو خۆم لێ دەپاراستو تووشی نەدەبوم، من هەر ترسێنەرو موژدەدەرم بۆ گەلێك کە باوەڕ دەهێننن، ئەم ئەرکەی سەرشانی من پەیوەندی بەزانینی غەیبەوە نیە، ئەمە دژی ئەو قسەیە نیە کە دەڵێن پغەمبەرمانﷺ چەندین شتی نهێنی باسکردوە، چونکە مەبەست ئەوەیە کە پێغەمبەرمانﷺ خۆی لە خۆیەوە نەبوە تا خوا ئاگاداری کردوەتەوە ئینجا پێغەمبەرمانﷺ ئەوشتەی باس کردوە واتە تازە لای پێغەمبەرﷺ بەشێوەی نهێنی نەما بەڵکو خوا تێیگەیاند کە ئاوا بووەو ئاوادەبێ، کەئەم شێوەیە تەنها بۆ پێغەمبەران نەبوە بەڵکو بۆ دۆستەکانی خوایش هەبووەو هەیە بەڵام نابێ کەس لافی نهێنی زانین لێبدات تا خوا خۆی ئاگاداریان دەکاتەوە ، هەرکەسێ لافی زانینی شتی نهێنی لێدا نەك دۆستی خودا نیە بەڵکو بێ باوەڕەو دوژمنی خودایە. ئینجا ﷲ باسی دروستبوونی ئینسانو زۆربونی ئیسانمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٨٩) خوا ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروستکردوە لە یەك کەس کە(ئادەم)ەو لەو کەسەش هاوسەری بۆ دروستکرد کە دایکە حەوایە، لە پەراسوی ئادەم عليه السلام حەوای دروستکرد تا ئارام بگرێ لای ئەو هاوسەرەیو خوی پێوە بگرێت وەك لە ئایەتی بیستویەکی سورەتی (الروم)دا هاتوە کە دەفەرموێ:﴿ جا هەندێ بەڵگە لەسەردەسەڵاتودانایی خوا ئەوەیە کەلە خۆتان هاوسەری بۆ دروستکردن تا ئارام بگرن لە گەڵیاو لە نێوانتاندا خۆشەویستیەکی راستەقینەو سۆزو بەزەیی داناوە﴾ ئینجا خوا لەپاش باسی باوکە گەورە ئادەمو پەیدابونی خۆشەویستیو دۆستایەتی بەهۆی هاوسەرییەوە باسی بارداریو ئاکامەکەیمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ: جاکاتێ پیاو چوەلای خێزانی ئەویش بارێکی سوکی هەڵگرتو سکی پڕبوکە سەرەتا شتێکی زۆرکەمە جا ئەوئافرەتە بەو سکە ماوەیەکی بردە سەروکەم کەم بەرەوگەورە بون رۆیشت ئینجا کاتێ کە سکەکەی گەورەبو هەردووکیان دەپاڕانەوە لەخوا ئەگەر بێتو تۆ ئەولادێکی چاکمان پێ بدەی بەراستی ئێمە سوپاست دەکەین لەسەر ئەو نیعمەتە

إِنَّ وَلِـِّۧيَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي نَزَّلَ ٱلۡكِتَٰبَۖ وَهُوَ يَتَوَلَّى ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٩٦﴾ وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَكُمۡ وَلَآ أَنفُسَهُمۡ يَنصُرُونَ ﴿١٩٧﴾ وَإِن تَدۡعُوهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ لَا يَسۡمَعُواْۖ وَتَرَىٰهُمۡ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ وَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿١٩٨﴾ خُذِ ٱلۡعَفۡوَ وَأۡمُرۡ بِٱلۡعُرۡفِ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿١٩٩﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٠٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ إِذَا مَسَّهُمۡ طَٰٓئِفٞ مِّنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبۡصِرُونَ ﴿٢٠١﴾ وَإِخۡوَٰنُهُمۡ يَمُدُّونَهُمۡ فِي ٱلۡغَيِّ ثُمَّ لَا يُقۡصِرُونَ ﴿٢٠٢﴾ وَإِذَا لَمۡ تَأۡتِهِم بِـَٔايَةٖ قَالُواْ لَوۡلَا ٱجۡتَبَيۡتَهَاۚ قُلۡ إِنَّمَآ أَتَّبِعُ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّ مِن رَّبِّيۚ هَٰذَا بَصَآئِرُ مِن رَّبِّكُمۡ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠٣﴾ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن مِّنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ۩ ﴿٢٠٦﴾

(١٩٠) کەچی لەو کاتەدا کە خوا کوڕی ڕێك و پێکی پێ دەدان لەباتی شوکری ئەو نیعمەتەو سوپاسی بێ پایانی خوا ئەوان هاوبەشیان بۆ خوا دادەنا چونکە دەیان وت: بەبۆنەی فلاَن پێاو چاکەوە یان فلاَن قەبرەوە، وەیان فلاَن دەرمانەوە بوە ، بەم شێوە دەبون بەموشریك و هاوبەش دانەر بۆ خوا لەونیعمەتەی کە خوا پێی دابون، جا بلَند مەقامو بەشکۆیە خواو هیچ نیازیکی نیە بەوەی کەئەوان دەیکەن بە هاوبەشی. لەبارەی ئەم ئایەتەوەمانای تر کراوە بەلاَم من وام بەچاك زانی هەر خوایش زانایە، ئەگەر چی باسەکە باسی ئادەمو حەوایە بەلاَم مەبەست نەوەی ئەوانە ئەوەتە دیسان لەم ئایەتی دواییەدا بەکۆباسیان دەکاتو دەفەرموێ:

جَزَآءٌئایە ئەوان شتێك دەکەن بەهاوبەشی خوا کەهیچ شتێك دروست ناکات بەڵکو ئەوان هەرخۆیشیان دروست دەکرێن.

(١٩٢) ئەوسا ئەوان ناتوانن یارمەتیان بدەن بەڵکوناتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن جا شتێك کەنەتوانێ یارمەتی خۆی بدات وپارێزگاری لە خۆی بکات لەبەرامبەری ڕوداوی زەمانەوە ئەی چۆن دەتوانێ یارمەتی ئەوان بداتو بەچ عەقلێك ئەوان پەیڕەوی دەکەنو دەیپەرستنو دەیکەن بەهاوبەشی خوا ؟! مەگەر ئیبراهیم ﷺ بتەکانی گەلەکەی خۆی نەشکاند؟ دەی کامیان توانیان دژی ئیبراهیم بوەستن؟ ئینجا ﷲ زیاتر پوچی پەرستراوەکانیان باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٩٣) خۆ ئەگەر بەرەو ڕێنمایی‌و سودی خۆیان بانگیان لێ بکەن پەیڕەویتان ناکەنو یەکسانە لای ئەوان چ بانگیان بکەنو چ بێ دەنگ بن واتە پەرستراوەکان توانایی هیچیان نیە چ بیان پەرستن یان جنێویان بدەنێ ، وەچ بانگیان بکەن یان هیچ قسەیان لەگەڵدا نەکەن ، ئەوەندە شتێکی بێ ناوەرۆك و پوچن.

(١٩٤) بەبێگومان ئەوانەی کە ئێوە بانگیان دەکەنو دەیان پەرستن بێجگە لە خوا ئەوانیش هەربەندەن وەکو ئێوەو زیاتر لە ئێوەیان لێ نایەت ، جا ئەگەر باوەڕناکەن دەی بانگیان بکەن جا باوەڵاَمتان بدەنەوە ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن لەوەی کە دەڵێن: ئەمانیش هاوبەشی خوانو دەتوانن شت بکەن. ئینجا خوا زیاتر بێ نرخی پەرستراوەکانیان دەردەخاتو دەفەرموێ:

(١٩٥) ئایا ئەوانەی کە ئێوە دەیان پەرستن کە خۆتان لەداروبەرد دروستان کردوون ئایا ئەوان قاچیان هەیە پێی بڕۆن؟ ئایا دەستیان هەیە کە زللە لە خەڵکی بدەنو تۆڵە لە خەڵی وەرگرنەوە؟ ئایا چاویان هەیە کەخەڵکی ببینن بۆئەوەی بزانن چی دەکەن؟ وەئایا گوێیان هەیە قسە ببیستن؟ دەی کە ئاوەهابن کەی شایانی پەرستنن؟ بەراستی زۆربەی پەرستراوەکانی مرۆڤ ئاوەهان بتی لە دارو بەرد داتاشراو پارەو کورسی‌و ناوبانگو نەفس‌وحیزب کە ئەمانەهەمویان کراون بەخوای خەڵك و خەڵك دەیان پەرستن هەمویان لەوشتە بێ قاچو دەستو چاوو گوێیەن جا دەبێ چییان لەدەست بێ؟ ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: هەمو شەریکەکانتان هەرچی هەن بانگیان بکەن بابێن لەپاشان هەرچی فڕو فێڵتان هەیە دژی من بیکەن ئەوسا هیچ مۆڵەتیشم مەدەن واتە بێ منەت بنو چیتان لە دەست دێت بەخۆتانوخواکانتانەوە دژی من بیکەن.

ئەی موسڵمان ئەمە سروشتی ئەم ئاینەیە پێویستە هەڵگرانی ئاوەها زرنگ بن لە بەرامبەر بێ باوەڕو ستەمکارانەوە چونکە یارمەتی دەری ئەوان هەر ئەو خوا بێ لاقو بێدەستو بێ‌چاوو بێ گوێیە بەلاَم یارمەتی دەری باوەڕداران ئەو پەروەردگارە خاوەن دەسەڵاتەیە کە ئەگەر ئارەزۆی نەمانی ئەم بوونەوەرە بکات هەرئەوەندەی دەوێ کە بفەرموێ ببە دەبێ‌و یەك چاو بڕکەیەك دوا ناکەوێت، هەروەکو لێرەدا ڕێنمایی پێغەمبەرمان ﷺ دەکاتودەفەرموێ: بڵێ با هەمو خواکانیان کۆکەنەوەو چی دەتوانن بەرامبەر بەتۆ بائەنجامی بدەنو منەتیان لێ مەزانەو بڵێ:

(١٩٦) بێگومان کەدۆستو یارمەتی دەری من (ﷲ)یە ، ئەو (ﷲ)یەی کە ئەم قورئانەی ڕەوانەکردوەو هەر ئەوە هەمیشە

سەرپەرشتویارمەتی دەری ساڵحان. لێرەوە دەردەکەوێ کە یارمەتی و سەرپەرشتی و دۆستایەتی ﷲ تەنها بۆ پێغەمبەرمانﷺ نیە بەڵکو بۆهەمو مرۆڤێکی خواناسی چاکە لە هەمو کاتو لە هەمو جێگایەکدا. وشەی (صالح) واتە گونجاو ، کەسێ کە گونجاو بێ لەگەڵ خوای خۆیداو هەمیشە ئامادەی جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی بێ‌و بە ئەنجامدانەکانیشی دڵخۆش بێ‌وخۆی لە تاوان‌و خراپە بپارێزێ ئەم جۆرەکەسە خوا سەرپەرشتو یارمەتی دەرو دۆستیەتی‌و دەیپارێزێت. ئینجا جارێکی تر بێ نرخی بتەکان باس دەکاتودەفەرموێ:

(١٩٧) ئەوکەسانەی کە ئێوە بێجگە لە خوا دەیان پەرستن ناتوانن هیچ یارمەتیەکتان بدەن‌وناشتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن.

(١٩٨) خۆ ئەگەر ئێوە بانگیان بکەن بۆ هیدایەتو ڕێنمایی نابیسن چونکە گوێی بیستنیان نیەو تۆ دەبینی کە ئەوان تەماشای تۆ دەکەن لەحاڵێکدا کەئەوان نابینن چونکە چاویان لەبتەکانەوەیەو هیچی ترنابینن. دەڵێن: موعازی کوڕی عەمری کوڕی جەموحو موعازی کوڕی جەبەل ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دوو گەنج بون موسڵمان بون لە کاتێکا پێغەمبەرﷺ چوە مەدینە ئەوان بەشەو دەگەڕان‌و بتەکانی موشریکەکانیان دەشکاندو پارچەکانیان دەبرد بۆ بێوە ژنان بەڵکو گەلە کەیان بیربکەنەوەو واز لە بت پەرستی بهێنن، جالەو کاتەدا کەعەمری کوڕی جەموح کە گەورەی گەلەکەی خۆی بوهێشتا موسڵمان نەبو بتێکی هەبو دەیپەرستو بۆن خۆشی دەکرد ئەم دووانە بەشەو دەهاتن‌و سەرو بنیان دائەناو پیسیان پێوە دەدا عەمر کەدەهاتو چاوی پێ دەکەوت کەچی لێکراوە عەمر دەیشۆردو بونی خۆشی لێ دەدا، جارێکیان شمشێرێکی هێنایە لایو پێی وت: "تۆڵەی خۆت وەرگرە" ئەوانیش هاتنەوەسەری‌و چەند جارێك وایان لێ کرد تا شەوێك کەهەستان توتکە سەگێکی تۆپیو هەبو لەوێ بەستیان پێیەوەو خستیانە بیرێکەوە . جابەیانی کە عەمری کوڕی جەموح هاتو ئەوەی دی تێگەیشت کەئەم بیرو باوەڕەی ئەو غەڵەتوهەڵەیە وتی: "بەخوا قەسەم ئەگەر تۆ خوایەك بویتایەو داوای پەرستنت بکردایە تۆئێستا لەگەڵ ئەو سەگەدا هاومل نەدەبویت". لەپاشان بو بەموسڵمانێکی چاكو لە غەزای "ئوحود"دا شەهید بو.

ئینجا خوای داناو زانا کاتێ کە بەو شێوەیە باسی بتو بت پەرستانی کرد ئاگادارە کەئەوان زیاتر ڕقیان هەڵدەسێ‌و زیاتر قسەی ناشیرین دەکەن لەبەر ئەوە پێغەمبەرمانﷺ ئاگادار دەکاتەوەو داوای ڕەوشتی بەرزو بەنرخی لێ دەکاتودەفەرموێ:

(١٩٩) تۆ چاوپۆشی‌و لێبوردن بکە بەپیشەی خۆتو فەرمان بدە بۆ کردنی ئیشی چاك‌و پشت بکەرە نەفامەکان‌و بەناشیرینی وەڵامیان نەدەیتەوە، وتراوە "کاسە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێت" پێغەمبەرمانﷺ قسەی جوان‌و ڕەوشتی بەرزی تێدایەو دەبێ هەر ئەوەی لێ چاوەڕێ بکرێت، وەنەفامەکانیش قسەی ناشیرین‌و ڕەوشتی نزمیان لایەو بێجگەلەوەیش چاوەڕوانی شتی تریان لێ ناکرێت. ئینجا خوا باسی دوژمنێکی تری خاوەن باوەڕان کەشەیتانەو ڕێگای چۆن خۆپاراستنی لێی دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٠٠) خۆ ئەگەر لە شەیتانەوە دالغەیەکی خراپ هات بەدڵتاو ویستی بەرەو هەڵدێرت ببات، ئەوساچارەی تۆ ئەمەیە کە پەنابگریت بەخوا، چونکە بێگومان کە ئەو بیسەرو زانەرە و شەیتان ناتوانێت بەبێ ویستی ئەوهیچ ئیشێك بکات. واتە پێویستە خاوەن باوەڕان لەبەرامبەری دوژمنی ئینسانیەوە چاوپۆشی‌و فەرمان بەچاکەو وەڵام دانەوەی ئەوان بەجوانی بکات بەپیشە بۆ خۆی‌و بەم شێوەیە دەتوانێ ئیشی خۆی بەرەو پێشەوەببات بەڵام لە بەرامبەر دوژمنایەتی شەیتانەوە چونکە دروستکراوێکی نادیارە مرۆڤی خاوەن باوەڕ هیچی پێ ناکرێتو ناتوانێ خۆی لێ بپارێزێت لەبەرئەوە پەروەردگاری میهرەبان سەرپەرشتو یارمەتی دەری خاوەن باوەڕانەو دەفەرموێ: لەم بارەوە داوا لە خۆم بکەن تابتان پارێزم هەروەك لە سورەتی (المومنون) ئایەتی ٩٨/٩٧ بە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:﴿ کەپەنا بە پەروەردگارت بگرە لەدالغەی شەیتانەکان﴾. ئینجا دەفەرموێ:

(٢٠١) بەبێگومان ئەوانەی کەلە خوا دەترسن هەرکاتێ خەتەرەیەکی خراپ لەلایەن شەیتانەوە بەدڵیاندا هات هەرزۆر زوو بیر دەکەنەوەو یادی خوا دەکەن ئیتر کتوپڕ بەر چاویان ڕۆشن دەبێتەوەو ڕاستی دەبینن‌و لە خەتەرەی خراپ دوور دەکەونەوە ، لێرەدا خوای زاناو دانا خەڵکی کردوە بەدوو بەشەوە یان لە خواترسن‌و پەیڕەوی لەودەکەن‌و لەرەفتاری ناڕێك دور دەکەونەوەو هەمیشە لەبیری خودادان یان لاسارو سەرلێ شێواو پەیڕەوی کەری شەیتانن کە شەیتانیش برادەرێکی خراپەو هەرگیز درێغی ناکات لە تێکدان‌و گومڕاکردنیان ، وەك دەفەرموێ:

(٢٠٢) ئەوسا برای بێ باوەڕان کەشەیتانەکانن هەمیشە یارمەتی برا ئینسانەکانیان دەدەن کە زیاتر خراپە بکەن‌و زیاتر لەڕێگای ڕاست لایان بدەن ، خۆ کۆتای ناکەن لە یارمەتی دانایان بۆ

خراپەکردن ، جا هەر ئینسانێك تەماشای خۆی بکاتو بزانێ بەرکام دەستەیان دەکەوێت ئایا لەوانەیە کە هەمیشە لەبیری بەندایەتی خواو ئیشی چاکەدایەو بەبچوکترین تاوان دڵتەنگ دەبێ یان هەر خەریکی ژیانی دنیایەو مەگەر بەدەگمەن ئەگینا خواو ئیشی چاكو پاشە ڕۆژی ناکەوێتە بیر؟ ئینجا خوا باسی سەرکەشیو لاساری ئەو خەڵکە دەکات کە یەکەم جار ئەم قورئانە هاتوەتە ناویانو دەفەرموێ:

(٢٠٣) ئەوسا ئەگەر ئەوان داوای موعجیزەیان کرد ئەی محمدﷺ تۆ موعجیزەت پیشان نەدانو نیشانەیەکی ئاشکرات بۆ نەبردن دەڵێن: دەی تۆ بۆ لەخۆتەوە شتێك ناهێنیت خوایش دەفەرموێ: پێیان بڵێ: من تەنها پەیڕەوی ئەوەم کەلە لایەن پەروەردگارمەوە بۆم دێتو من لە خۆمەوە هیچم پێ ناکرێت، من هەرگەیاندنی ئەم پەیامە ئەرکی سەرشانمەو هیچی تر، ئینجا خوا دەفەرموێ: ئائەم قورئانە هۆی بەرچاو ڕۆشنیە لەلایەن پەروەردگارتانەوەو هۆی ڕێنمایی‌و ڕەحمەتو سۆزە بۆ گەلێ کە باوەڕبهێنن. واتە تەنیا باوەڕداران چاو ڕۆشنی‌و ڕێنمای وسۆزیان بەهۆی ئەم قورئانەوە دەست دەکەوێت ، وەهەر ئەم قورئانە بەسە بۆخەڵك ئەگەر زاناو خاوەنی بیری ڕێکو پێك بنو پێویست بە موعجیزەی تر ناکات چونکە موعجیزەکان کاتیە بەلام ئەم قورئانە بۆ هەمو کاتەو دەبێ موعجیزەکەی لەگەڵ خۆیدا بێت ، کەوایشە" پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار پەڕاوێکی هێناوە هەمو زانایەك لە بەرامبەرییەوە دەستەوسانەو نەیان توانیوەو هەرگیز ناشتوانن سورەتێکی بچوکی وەك ئەو پەڕاوە بهێنن"دەی پێویستە ئەم قورئانە چاك بزانرێتو بە باشی گوێی بۆ بگیرێت تابەباشی سودی لێ وەرگرن، بۆیەدەفەرموێ:

(٢٠٤) جا هەرکاتێك ئەو قورئانە خوێندرایەوە مادام هیدایەتو ڕەحمەتو چاوڕۆشنییە بەگاڵتەو سادەی مەگرنو وا مەزانن تەنها دەنگێکەو بەس بەڵکو بەباشی گوێی لێ بگرن وبێدەنگ بنو قەپو قاڵ نەکەن بەڵکورەحمتان پێ بکرێت. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەکاتێ قورئان خوێندرا پێویستە دووشت بکرێت **یەکەم**: گوێ گرتن لەو قورئانەوهەوڵدان بۆتێگەیشتن لێی. **دوهەم**: بێ دەنگ بوون، واتە حەرامە لەکاتی قورئان خوێندندا قسەکردنو گوێ نەگرتن، چونکە دوو وەسفی کافرو بێ باوەڕەکانە وەك لەسورەتی "فصلت"ئایەتی بیستوشەشدا دەفەرموێ: ﴿خوانەناسان وتیان: گوێ لەم قورئانە مەگرنو قسەی بێتامو بێ مانای خۆتانی تێکەڵ بکەن بەڵکوسەرکەون بەسەریا﴾

وەزانایان ئەمە دەکەن بەبەڵگە لەسەر ئەوەی کە لەپاش ئیمامێکەوە کەلەو نوێژانەدایە دەنگی تێدا بەرز دەکرێتەوەو قورئان دەخوێنێ نابێ مەئموم قورئان بخوێنێ بەڵکو پێویستە گوێ بگرێت لەو قورئانەی کە ئیمام دەیخوێنێت تەنانەت لەسەر خوێندنی سورەتی فاتحەیش قسە هەیە بەڵام من ئەو ڕەئیەم بەلاوە نزیکترە کە دەڵێ: دەبێ فاتیحە بخوێنرێت، هەر خوایش زانایە، بەڵێ، قورئان ئەو پەڕاوە بەرنرخەیە کە دەبێ بەهۆی جیاکردنەوەی خەڵك وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {**إن اللهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ** /مسلم/ بەبێگومان ﷲ گەلانێك بەو قورئانە بەرز دەکاتەوەو گەلانێکی تری پێی نزم دەکاتەوە} قورئان ئەو پەڕاوەیە کە خوێنەری تاجی ویقاری دەخرێتەسەر وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {**وَيُوضَعُ عَلَى رَأْسِهِ تَاجُ الْوَقَارِ وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَيْنِ لاَ يُقَوَّمُ لَهُمَا أَهْلُ الدُّنْيَا فَيَقُولاَنِ بِمَ كُسِينَا هَذِهِ فَيُقَالُ بِأَخْذِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ ثُمَّ يُقَالُ لَهُ اقْرَأْ وَاصْعَدْ فِي دَرَجَةِ الْجَنَّةِ وَغُرَفِهَا فَهُوَ فِي صُعُودٍ مَا دَامَ يَقْرَأُ هَذًّا كَانَ أَوْ تَرْتِيلاً**/أ دوغ ه، صحه الألبا / ئەوکەسەی کەخاوەنی قورئانەو قورئان بخوێنێتو ئیشی پێ بکات تاجی ویقاری دەخرێتە سەرو باوكو دایکی مادام بەباوەڕداری مردبن دووپۆشاکیان پێ دەدرێت کە هەمو خەڵکی دنیا نرخی ئەودووپۆشاکەیان پێ نادرێت جا دەڵێن: بەهۆی چییەوە ئەم پۆشاکانەمان پێ دراوە؟ پێیان دەوترێت: بەهۆی ئەوەیە کەمناڵەکەتان قورئان فێربوە . مناڵە کەیشیان لەڕۆژی قیامەتدا تاجی ویقاری لەسەر دادەنرێتو پێی دەوترێت بخوێنەو بەپلەکانی بەهەشتو بەهۆدەکانیدا سەرکەوە ، جا هەمیشە لە سەرکەوتندایە تا ئاخر ئایەتێك کە خوێندویەتی لەدنیادا چ بە پەلەبێت چ بەهێواش}

بەڵێ، قورئان شافیعە بۆ قورئان خوێن بەو مەرجەی کەلەم فەرمودەدا هاتوە کە { **اقرؤوا القرآنَ و اعملوا بِهِ ، و لا تَجْفُوا عنه، و لا تَغْلوا فيه و لا تأكلوا به، و لا تسْتَكثروا به** /جامع الصحيح، صحه الالبا / قورئان بخوێننو ئیشی پێ بکەنو لێی لامەدەنو زیادەڕەوی تێدا مەکەنو پێی مەخۆنو بەوهۆیەوە داوای زۆری ناوبانگو ماڵی دنیا مەکەن}

بەداخەوە ئەمڕۆ قورئانی ئێمە بۆنان پێ خواردنەو دەنگ خۆشیەو کاتی خوێندنی ئەم قورئانە گوێی لێ ناگیرێتو من خۆم دەیانو سەدان جار دیومە لەمزگەوتدا ئەوقورئان خوێنە ناحەقە قورئان دەخوێنێت کابرای خۆ بەموتقی زان لەباتی گوێگرتن لەقورئانەکە خەریکی تەسبیحات بوە نازانن لەباتی چاکە کارێکی حەرام دەکەن؟! لەهەمو خراپتر مامۆستاو پیاوماقولانی خەڵکی گەڕەك لەکاتێکدا کەقورئان خوێن لەمزگەوتدا قورئان دەخوینێ ئەوان لەحوجرەی مامۆستادا خەریکی دەمەتەقەو چای خواردنن؟!! کورد واتەنی "ئەگەر

گۆشت بگەنێ خوێی تێدەکرێت ، ئەی ئەگەر خوێ گەنی چی لێ بکەین "

بەداخەوە هەرکە دەنگی قورئان هات لەمزگەوتێکەوە بەلگەیە لەسەر مردنی کەسێك بەو مەرجە قورئان بۆ زیندو کردنەوە هاتوەو بۆ زیندوەکانە، هەرچەند قورئان خوێنی چاكو بێ کرێ سودی دەبێ بۆ باوكو دایکی خۆی ، جێگای خۆیەتی ئەوەش بڵێین کەقورئان خوێنەکانی ئەمڕۆ زۆریان لە باتی خەیرو چاکە لەوانەیە تاوانێکی زۆریان بۆ بنوسرێت. چونکە هەیە تەنها لەبەر دەنگ خۆشی دەیخوێنێو هەیە مەبەستی پارە پێ وەرگرتنەو هەیە لە مزگەوتدا کە جێگای نوێژە بێشك کەنوێژکەری تێدایە بەدەنگی بەرز قورئان دەخوێنێو نوێژی نوێژکەراون نارێك دەکات بەتایبەت لە ڕۆژانی جومعەدا کەخەڵکی هەمیشە دێنە مزگەوتو هەمیشە کۆمەڵێك بە نوێژکردنەوە خەریکن چونکە سونەتە ، قورئان خوێنیش گوێی لەکەس نیەو نیو سەعات زیاتر بە قورئان خوێندنەوە بەدەنگی بەرز خەریکە جا ئەمە ئەگەر هیچکامیش نەبێ لەبەشەکانی سەرەوە تاوانی زیاترە تا چاکەی چونکە وەك وتمان نوێژی نوێژکەران نارێك دەکات، من خۆم چەند جار ناچار بووم ئایەتێکم چەندبارە کردبێتەوە بەتایبەت ئەگەر قورئان خوێن قورئانەکەی بەهەڵە خوێندبێتەوە، کە قورئان خوێنی ناو مزگەوتەکان لەسەدا هەشتایان لەوانەن کە قورئانەکانیان نارەوانە هیوادارم کە قورئان خوێنان چاوێك بە خۆیاندا بخشێننو بزانن خۆیان لەکام تاقم دا دەبیننەوەو لەهەڵەی پێشویان پاش گەز ببنەوەو بە شێوەیە قورئان بخوێنن کە سودی هەبێ بۆیان وتراوە (دۆست ئەوەیە بتگرێنێو دوژمن ئەوەیە بتکەنێنێ).

لەپاشا ﷲ رودەکاتە پێغەمبەرﷺ کەمەبەست ئوممەتەکەیەتیو دەفەرموێ:

(٢٠٥) لەدڵی خۆتدا زۆر بەگەردنکەچیو بەترسەوە یادی پەروەردگارت بکەو نەك بەدەنگی بەرز ، بە بەیانیانو بە ئێوارانو لەو ئینسانانە مەبە کە بێ ئاگانو یادی خوا نایەت بە دڵیاندا بەتایبەت لەو دووکاتەدا چونکە فریشتەکانی شەوو ڕۆژ کە مەئمورن لەلای ئینسان لەم دوو کاتەدا یەکتر دەگۆڕن ، وەك لە فەرمودەدا هاتوە ئەوانەی کە دەگەڕێنەوە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان بەراستی کاتێ کە ئێمە ڕۆیشتین بەیادی تۆوە خەریکبو کاتێکیش کە گەڕاینەوە لەلای هەربەیادی تۆوە خەریکبو، وەپێویستە لەسەر خۆوهێواش بێ وەك لەم ئایەتەدا فەرمویو دیسان پێغەمبەریشمان ﷺدەفەرموێ:{ يَا أَيُّهَا النَّاسُ ارْبَعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ فَإِنَّكُمْ لَا تَدْعُونَ أَصَمَّ وَلَا غَائِبًا إِنَّهُ مَعَكُمْ إِنَّهُ سَمِيعٌ قَرِيبٌ تَبَارَكَ اسْمُهُ وَتَعَالَى جَدُّهُ /البخاری/ئەی خەڵکینە بەزەییتان بەخۆتاندا بێتەوەولەسەر خۆتان یادی خوابکەن بەراستی ئێوە داوا لە کەڕ، یان نادیار ناکەن، بەبێگومان ئەوەی کە ئێوە بانگی دەکەن بەزانیاریو بیستنو گەماڕۆدانتان لەگەڵتاندایە، بەبێگومان ئەوەی کە ئێوە بانگی دەکەنو یادی دەکەن بیسەرەو نزیکە ، ناوی پڕفەڕو خێرەو باڵایە دەسلاتەکەی}.

واتە یادکردنی خوا هەتا شاراوەترو بێ دەنگ تربێ باشترە چونکە نە سەر لە خەڵك تێك دەداتو نە ناڕەحەتی بۆ خەڵك دروست دەکات ، وە دوورترە لەڕیایی، جا تەماشابکەنو بزانن کەئەم ئایینە چەندە بەسۆزە بۆرێكو پێك کردنی پەیڕەوانیو چەندە هەوڵ دەدات کە پەیڕەوانی فێری ڕەوشتی بەرزو جوان بکات ، جا نابێ ئیشی بیدعە چیان بە ئیشی ئیسلامی تەماشا بکرێتو ڕەخنە لە ئیسلام بگیرێت ، ئیسلام ئەوەیەو بەرنامەکەی ئەوەیە کەلە بەردمتاندایەو قەپو قاڵی بێ جێگای هەندێ کەس لە پێش نوێژی بەیانیو پاشو پێشی بانگەکانو کۆڕ گرتن بەناو زیکرەوەو دەنگ بەرزکردنەوە بەشێوەیەك کەدەبێ بەهۆی ناڕەحەتی خەڵکی دەوروبەری ئەو شوێنەو سەر تێکدان لە نوێژگەران یان قورئان خوێنان ئەگەر نوێژگەر نەبو لەو شوێنەدا، ئەمانە ئیشی ئیسلامی نینو ئیسلامو موسڵمانانی ڕاستەقینە بێزارن لێیانو بانگیان دەکات بۆوازهێنان لەبیدعەو بیدعەچییان ، بەڵام یادی خوا بەشێوەی نهێنی وبەدڵ شکاویو بەترسەوە زۆربەنرخەو هەربەوەش دڵەکان پاك دەبنەوەو ئارام دەگرن جگە لەوکات وجێگایانەی کە دەنگ بەرزکردنەوە تێیانداجوانو ڕەوایەوەك دەنگ بەرزکردنەوەی حاجیان بەزیکرەکانی ڕۆژانی حەج. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٢٠٦) بێگومان کە ئەوانەی لەلای پەروەردگارتن واتە ئەو فریشتانەی کە خوا پلەو مەقامی بەرزی پێ داوون خۆیان بەگەورە ناگرن لەبەندایەتی کردنی خواداو هەمیشە تەسبیحاتی ئەوزاتە دەکەن وتەنها بۆ ئەو گەردن کەچی دەکەنو سوجدە دەبەن ، واتە موسڵمانانیش حەقیانە ئاوەها وەك ئەوانە کە تاوانیش ناکەنو هەمیشە لە عیبادەتی خوادان ئەوان کە گوناه تاوانیش دەکەن ئەبێ زیاتر بە بەندایەتیو گوێڕایەڵی خواوە خەریك ببنو دنیا بۆ تاقی کردنەوەی ئێمەو جنۆکەکان دروستبوەو بەگوێرەی کۆششو بەندایەتی ئەم دنیایە لەبەهەشتدا بەشدار دەبین، جاکێ دەیەوێ جێگای خۆی چاکترو خۆشتر بکات باپەلە بکات. تێبینی: لە قورئاندا چەند جێگا هەیە سوننەتە ئەگەرخوێنران کابرای خوێنەرو گوێگر سوجد ببەن کە کۆتایی ئەم سورەتە پاش وشەی ﴿ يَسْجُدُونَ ﴾ یەکێکە لەو جێگایانە.

تەواو بوو پاش عەسری یەك شەممە ٢١/محررم/١٤٢٢کۆچی لە هاوینەهەواری سەلاحەدین.

## ٨ سورەتی ئەنفال ٧٥

سورەتی ئەنفال کە بە سورەتی "بەدر"یش ناو براوە و سورەتی هەشتەمی قورئانە لەمەدینەدا دابەزیوەو حەفتاو پێنج ئایەتە. پێویستە بزانرێت پێغەمبەرو یارە بەوەفاکانی سیانزە ساڵ لەمەکەدا لەژێر سەخت ترین ئەشکەنجەو ئازاردا ژیانیان بردەسەر بەشێوەیەك کەهەندێ لەیارەکانی ئەم پێغەمبەرە ئازیزەﷺ لەژێر ئەشکەنجەدا گیانیان سپارد بەگیان ئافرین‌و لە ژیانی دنیادا ماڵ ئاواییان کرد، وەلەم چەند ساڵەدا ﷲ ماوەی بەباوەڕداران نەدا کە شەڕ بکەن لەگەڵ ئەو بێ باوەڕوو بێ ڕەحمانەدا بەڵکو فەرمانیان پێ کرا کەوڵات‌و خزم‌و کەس‌و کاری خۆیان بەجێ بێڵن‌و کۆچ بکەن بۆ مەدینە جا موسڵمانانیش بەگیان‌و بەدڵ فەرمانی کۆچیان وەرگرت وچوونە مەدینە ئەوسا ﷲ ماوەی بە موسڵمانان دا کە پارێزگاری لە خۆیان بکەن لە ستەمکاران وەك لە ئایەتی سیو نۆی سورەتی(حەج)دا هاتوە. بەڵی پێغەمبەرمانﷺ لەشاری مەدینە پاش دامەزراندنی بناغەی یەکەم دەوڵەتی ئیسلامی بیری لەوەکردەوە کە پێشەکی ڕێگای بازرگانی قورەیش کەم کاتەوەو تەنگیان پێ هەڵچنێ، جا بۆ ئەم مەبەستە چەند کۆمەڵە لاوێکی بەم لاولادا نارد تا ساڵی دووهەمی کۆچی کە بیستی قافڵەیەکی گەورەی قورەیش بەسەرپەرشتی ئەبو سوفیان چوە بۆ شام‌و واخەریکە بەسەرمایەیەکی زۆرەوە بەرەو "مەکە" دەگەڕێتەوە، پێغەمبەری ئازیزمانﷺ پرس‌و رایەکی بەیارەکانی کرد کە بەتەمایە بچێتە ڕێگای ئەو قافڵە بەڵام چون چاوەڕێی شەڕ نەدەکرا زۆر بەگرنگ نەگیراو سەرئەنجام پێغەمبەرﷺ خۆی‌و سێ سەدو چەند کەسێك بەچەك‌و چۆڵەیەکی سادەوە ڕۆیشتنە ڕێگای بەڵام ئەبو سوفیان زانی بەپەلە پیاوی ناردە مەکەو داوای لێ کردن کەبەدەمیەوە بێن‌و لە هەمان کاتدا توانی قافڵەکە لە کەناری دەریاوە رزگار بکات‌و دیسان پەیامی بۆ ناردن کەبگەڕێنەوە بەڵام ئەوان بە سەرپەرشتی ئەبو جەهل‌و زۆربەی سەرانی قورەیش بەهەزار نەفەری پڕچەك‌و شەڕکەرەوە هاتبون‌و تازە ئەبو جەهل سواری ئەسپی ئەجەل بوەو بەگوێی ئەبو سوفیانی نەکردو هاتنە نزیکی کانیەکانی بەدر، پێغەمبەریش ﷺ کە ئەمەی زانی پرس‌و رای بەیارانی کردو هەمویان ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ شەڕ، بەڵێ شەڕکراو ﷲ تۆڵەی لە ستەمکاران سەندەوەو حەفتا کەسیان لێ کوژراوحەفتا کەسی تریان بەدیل گیران‌و سەروەت‌و سامانێکی چاکیش کەوتە دەست موسڵمانەکان جا چونکە ئەمە یەکەم غەنیمەتبو کەلەدوژمنانەوە دەستیان کەوتبو، لەسەر ئەوەی کە بەسەر کێدا دابەش بکرێت دوچاری ناکۆکی بون، جا ﷲی گەورەومیهرەبان پاش تەواو بونی شەڕەکە ئەم سورەتەی ناردە خوارەوەو سامانەکەی خستە دەست پێغەمبەرمانەوە ئەویش بەشێوەیەکی دادپەوەرانە دابەشی کرد بەسەریاندا.

## ٨ سُورَةُ الأَنفَال ٧٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَنفَالِ ۖ قُلِ ٱلْأَنفَالُ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَصْلِحُوا۟ ذَاتَ بَيْنِكُمْ ۖ وَأَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١﴾ إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُؤْمِنُونَ حَقًّا ۚ لَّهُمْ دَرَجَٰتٌ عِندَ رَبِّهِمْ وَمَغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ كَمَآ أَخْرَجَكَ رَبُّكَ مِنۢ بَيْتِكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ لَكَٰرِهُونَ ﴿٥﴾ يُجَٰدِلُونَكَ فِى ٱلْحَقِّ بَعْدَ مَا تَبَيَّنَ كَأَنَّمَا يُسَاقُونَ إِلَى ٱلْمَوْتِ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٦﴾ وَإِذْ يَعِدُكُمُ ٱللَّهُ إِحْدَى ٱلطَّآئِفَتَيْنِ أَنَّهَا لَكُمْ وَتَوَدُّونَ أَنَّ غَيْرَ ذَاتِ ٱلشَّوْكَةِ تَكُونُ لَكُمْ وَيُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُحِقَّ ٱلْحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَيَقْطَعَ دَابِرَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧﴾ لِيُحِقَّ ٱلْحَقَّ وَيُبْطِلَ ٱلْبَٰطِلَ وَلَوْ كَرِهَ ٱلْمُجْرِمُونَ ﴿٨﴾

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ ئەی محمد ﷺ پرسیارت لێ دەکەن لەبارەی دابەشکردنی ئەو دەسکەوتەی کەلە دوژمنەوە دەستتان کەوتوە. وەك وتمان ئەم سورەتە پاش شەڕی بەدر کاتێ کە موسڵمانەکان سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردنی دەسکەوتەکە ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوە هاتە خوارەوە، چونکە لەکاتی شەڕەکەدا سێ بەش بون بەشێکیان دوای ئەوانە کەوتن کە شکستیان خواردبو جا بەدوای ئەواندا دەرۆیشتن‌و شەڕیان لەگەڵدا دەکردن، وەبەشێکی تریان دەستیان کرد بەکۆکردنەوەی دەسکەوتەکان‌و ئەوانەی کەلە مەیدانی شەڕەکەدا مابونەوە، وەبەشێکی تریان پارێزگاریان لە پێغەمبەرﷺ دەکردو لەلای مابونەوە نەك دوژمن لە گۆشەیەکەوە هێرش بهێنێتە سەر پێغەمبەرﷺ کە دوو بەشەکەی پێشوو هەرکامیان خۆی بەخاوەن دەسکەوت دادەناو ئەمانەی لای پێغەمبەریشﷺ دەیان وت: ئێمەش خاوەن بەشین‌و لەبەر پارێزگاری پێغەمبەرﷺ ئێمە لێرەدا وەستاوین ئاشکرایە کەﷲ دۆست‌و یارمەتی دەری خاوەن باوەڕانەو لە هەمو تەنگانەیەکدا دێت بەهاواریانەوە ، جا هەروەك لێرەدا ئەو سوپا بچوك‌و کەم چەك‌و چۆڵەیەی سەرخست بەسەر ئەو سوپا گەورەو پڕچەکەدا ئێستاش ماوە بەشەیتان نادات کە ئەو کۆمەڵە پاك‌و دڵسۆزە

پەرتەوازە بكاتو بەناردنی ئەم سورەتە ئەو گرێ كوێرەی بۆكردنەوەو فەرموی: ئەی محمدﷺ ئەوان لەبارەی دابەشكردنی دەسكەوتەكانەوە پرسیارت لێ دەكەن تۆیش چارەسەری ئەو ناكۆكیەی ئەوان بكەو بڵێ ئەو ماڵەی كەلە دوژمنانەوە كەوتوەتە دەستان ماڵی اللهیەو ماڵی پێغەمبەرەكەیەتیو مافی كەسی تری پێوە نیە ، بەم شێوەیە اللهی داناو زانا موسڵمانانی خستەوەیەكو تێیگەیاندن كەسێك لەوان مافی ئەوەی نیە كە ئەم دەسكەوتە بەهی خۆی بزانێ . ئینجا الله دەفەرموێ: لە الله بترسنو كێشە لەگەڵ یەكتردا دروست نەكەنو نێوانی خۆتان چاك بكەنەوەو یەكتر ئازارنەدەنو گوێ رایەڵی اللهو پێغەمبەرەكەی ﷺبن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن.

لەبارەی وشەی(أنفال)دا چەند قسەیەك كراوە، یەكەم: مەبەست ئەو شتانەیە لە كافرانەوە ئەكەوێتە دەست موسڵمانان بەبێ شەڕ كەئەمە لای زانایان بە (فیئ) ی ناو دەبەنو باسەكەی لە ئایەتی شەشی سورەتی حەشردادێت. دووهەم: مەبەست پێنج یەكە. سێهەم: مەبەست پێنج یەكە لە پێنج یەك . چوارەم: مەبەست هەمو دەسكەوتێكە كەئەمە رای جمهوری زانایانە. پێنجەم: مەبەست ئەو زیادەیە كە دەدرا بەو گرۆو دەستانەی، كە رەوانە دەكران بەم لاولادا. وەك لە پێشەوە وتمان ئەم سورەتە سەبارەت بەجەنگی بەدرو دەسكەوتەكانی هاتە خوارەوەو ئاشكرایشە كە ئەو دەسكەوتانە بەهۆی شەڕەوە بوەو بەگوێرەی هەواڵی دروست كە ئیمامی موسلیم لە عەلیەوە ئەیگێڕێتەوە كە بەشێوەی پێنج یەك دابەشكراوە{ **وَكَانَ النبي صل اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَعْطَانِي شَارِفًا مِنْ الْخُمْسِ** / پێغەمبەر ﷺ وشترێكی لە پێنج یەك پێدام لەو رۆژەدا كەرۆژی بەدربو}بەڵێ الله فەرمانی دابەشكردنی ئەو دەسكەوتەی دایە دەست پێغەمبەرﷺ و داوای لە خاوەن باوەڕان كرد كە نێوان خۆیان چاك بكەن.

تێبینی: بەكار هێنانی وشەی (الله) لەباتی (خوا ) یەكەم: بۆ ئەوەیە كە ناوەكانی پەروەردگار تەوقیفین. دووهەم: ناوێكی گەورەو كورتو خۆشو ناسراوە لەلای هەموكوردێك.

جا الله پێناسەیەكی باوەڕداری راستەقینە دەكاتو دەفەرموێ:

(٢) واتە باوەڕداران تەنها ئەوكەسانەن كە هەر وەختێ یادی الله كراو ناوی برا دڵەكانیان بترسێتو هەركاتێك ئایەتەكانی ئەو بخوێندرێ بەسەریاندا باوەڕیان زیاتر ببێت ، وەتەنها پشت بەپەروەردگاری خۆیان دەبەستن. لێرەدا سێ سیفەتی باوەڕداری راستەقینەی باسكرد ، هەركاتێ یادی الله كرا دڵیان دەترسێتو بەخوێندنەوەی ئایەتەكانی الله بەسەریاندا ، باوەڕیان زیاد دەكات ، وە تەنهایش پشت بە الله دەبەستن كەئەمانە سێ وەسفی شاراوەن. ئینجا باسی دوو وەسفی تری كرداریان دەكات و دەفەرموێ:

(٣) ئەوباوەڕدارانەكەسانێكن كە نوێژەكانیان جێ بەجێ دەكەنو لەوەی كە پێمان داوون دەبەخشن چ فەرز بێ لە سەریان وەك زەكات یان فەرز نەبێت وەك باقی چاكەكانی تر.

(٤)بەراستی هەر ئەوانەن باوەڕداری راستەقینە كەبۆ ئەوانە چەندین پلە هەیە لەلایەن پەروەردگاریانەوەو لێخۆش بوونو رۆزییەكی زۆر بەرێزیش ، واتە ئەوكەسەی كە ئەو پێنج سیفەتەی هەبو باوەڕداری راستەقینەیەو الله ی خاوەن بەخشش پلەی زۆر بەرزو گرنگی بۆ داناوەو لە تاوانەكانی خۆش دەبێو رزقو رۆزییەكی زۆرو بەرێزو بەفەڕی پێ دەدات. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ **إن أَهْلَ الْجَنة يَتَرَاءَوْنَ أَهْلَ الْغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا يَتَرَاءَوْنَ الْكَوْكَبَ الدري الْغَابِرَ فِي الْأُفُقِ مِنْ الْمَشْرِقِ أَوْ الْمَغْرِبِ لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ تِلْكَ مَنَازِلُ الْأَنْبِيَاءِ لَا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ قَالَ بَلَى وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ رِجَالٌ آمَنُوا بِاللهِ وَصَدَّقُوا الْمُرْسَلِينَ** / منفق عليه/ خەڵكی ناوبەهەشت هۆدەكانی خەڵكی سەر خۆیان ئەوەندە لە بەرزادەبینن هەروەك چۆن ئەستێرەی پرشنگدارەی ئاسمان، لەوپەری رۆژ هەڵاتەوە یان رۆژ ئاواوە دەبینن لەبەر ئەوزیادەوپلەیەی كەهەیە لەنێوانیاندا، وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوە جێگای پێغەمبەرانەو كەسی تر ناگات بەوان؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: نەخێر ، قەسەم بەو كەسەی كە گیانی منی بەدەستە پیاوانێكن كە باوەڕیان هێناوە بە الله و پێغەمبەرانیان بەراست زانیوە} كەواتە هەر بەهەشت شایستەی ئەوەیە كە كێبەركێی بۆ بكرێت.

(٥) هەروەك چۆن پەروەردگارت دەری كردیت لە ماڵی خۆتدا بۆ مەبەستێكی رەوا ، وە بێگومان كۆمەڵێك لەو باوەڕدارانە پێیان ناخۆش بوو لەم غەنیمەتو دەسكەوتەدا بەشی كەسی تری لێ بدرێت بێجگەلەخۆیان واتە هەروەك كۆمەڵێك پێیان ناخۆش بو بچیت بۆرێگای قافڵەی قورەیش هەرئاوا كۆمەڵكیش لەوانە كەلە شەڕی بەدرا بون پێیان ناخۆش بو كەسی تر بكرێت بەشەریكیان لەودەستكەوتە دا چونكە خۆیان بە زەحمەت كێشو شەڕكەر دەزانی ، وەك لە پێشەوە وتمان،

(٦) دەمەدەمەت لەگەڵدا دەكەن لەبارەی ئەو شتە راستەوە پاش ئەوەی كە ئاشكرابو وەك ئەوەی كەبەرەو مردن پاڵیان پێوە بنرێت ، چونكە ئەوان تەماشای كەمی خۆیانو زۆری دوژمنیان دەكرد جا وەك لەبارەی دەسكەوتەكانەوە كەوتنە كێشەوەو الله لەدەستی ئێوەی دەرهێناو خستەیە دەست پێغەمبەرەوەﷺ

هەرئاوەها لە کاتێکدا کە ئێوە پێتان ناخۆش بو کەدەربچن بۆ جەنگی بت پەرستان بەڵام ﷲ دەری کردن‌و دوچاری جەنگی کردن‌و سەری خستن بەسەر دژوارترین دوژمنانتاندا کەلە راستیدا ئەمە سودی گشتی تێدا بو بۆتان‌و بووە هۆی دەنگ زرانی ئیسلام‌و ترس‌و سام خستنە ناو دڵی بێ باوەڕو بت پەرستان‌و دوروەکانەوە ، هەروەك دەفەرموێ:

(٧) بیربکەنەوە لەو کاتەی کە ﷲ بەڵێنی یەکێك لەو دوو تائیفەی پێدان لەحاڵێکدا کە ئاوات دەخوازن‌و واتان پێ خۆشە کە ئەوەی زۆر گرنگ نیە کەقافڵەکەیە ئەوەتان دەست کەوێت تاهەم شەڕتان نەکردبێ‌و هەم سەروەت‌و سامانێکی زۆرتان دەست کەوتبێت ، لەراستیدا ئەمان لەبەر کەمی‌و کەم چەك‌و چۆڵەی خۆیان دەترسان ، بەڵام ئارەزۆی ﷲ جیایە لەگەڵ ئارەزۆی ئەواندا وەك دەفەرموێ: خۆ ﷲ دەیەوێ کە بیهێنێتە جێ ئەوەی کە ئارەزۆی لێیە بەبڕیاری خۆی‌و راستی دامەزرێنێ‌و بەهێزی بکات‌و سەربازانی خۆی دڵخۆش بکات‌و تێیان بگەیەنێ کەیارمەتی دەریانەو دوژمنان‌و ناحەزانیان سەرشۆڕو رسوابکات‌وقەرەچۆڵی کافران ببڕێ‌و دوایان بهێنێت.

(٨) تا راستی‌و حەقیقەت جێگیربکات‌و بەتاڵ و پوچ هەڵوەشێنێتەوە ، خۆ با تاوان بارانیش پێیان ناخۆش بێت. ئینجا ﷲ بەرەو روداوەکانی بەدر ئەمانبات‌و دەفەرموێ:

(٩) ئەی محمدﷺ بیر کەرەوە لەو کاتەی کە هاوارتان لە پەروەردگارتان دەکرد ئەوسا ئەویش وەڵامی دانەوەو فەرموی: بێگومان کە من یارمەتی دەری ئێوەم بەهەزار فریشتەی یەك لە دوای یەك، بەم شێوەیە ﷲ ی میهرەبان هات بەهانای موسڵمانانەوەو بەندە بێ گوناهەکانی خۆی نارده یارمەتیان ، بەڵام بۆ ئەوەی بیرو باوەڕی خاوەن باوەڕان بەهەڵەدا نەچێت‌و وانەزانن کەئەگەر فریشتە نەبوایە سەرکەوتن نەدەبو ئەوسا فریشتە بەهۆی سەرکەوتن بزانن دەفەرموێ:

(١٠) خۆ ﷲ ئەو فریشتانەی نەناردوە بۆ یارمەتی ئێوە مەگەر تەنها بۆ ئەوەبێ کە مژدەی راستی‌و دروستی ڕێبازەکەتان پێ بدەن‌و تا دڵەکانتان بە رەوانەکردنی فریشتەکان ئارام بگرێت ئەگینا ﷲ دەتوانێ سەرتان بخات بەسەر دوژمنەکانتاندا بەبێ فریشتەیش بۆیە فەرموی: وەهیچ سەرکەوتنێك نەبووە نابێ مەگەر لەلایەنﷲ وە بێ، ئەم جەنگ‌و جیهادە بۆ ئەوەیە پاك‌و پیس لەیەك جیاببێتەوە ئەگینا ﷲ ی داناو خاوەن دەسەڵات دەتوانێ هەربۆ خۆی بەیەك فەرمان هەمو بێ باوەڕو ستەمکارو دووڕو لە ناوببات وەك لە سورەتی محمد دا دەفەرموێ:

إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴿٩﴾ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ وَلِتَطْمَئِنَّ بِهِ قُلُوبُكُمْ ۚ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ إِذْ يُغَشِّيكُمُ النُّعَاسَ أَمَنَةً مِّنْهُ وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ وَيُذْهِبَ عَنكُمْ رِجْزَ الشَّيْطَانِ وَلِيَرْبِطَ عَلَىٰ قُلُوبِكُمْ وَيُثَبِّتَ بِهِ الْأَقْدَامَ ﴿١١﴾ إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلَائِكَةِ أَنِّي مَعَكُمْ فَثَبِّتُوا الَّذِينَ آمَنُوا ۚ سَأُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ فَاضْرِبُوا فَوْقَ الْأَعْنَاقِ وَاضْرِبُوا مِنْهُمْ كُلَّ بَنَانٍ ﴿١٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَاقُّوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ۚ وَمَن يُشَاقِقِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٣﴾ ذَٰلِكُمْ فَذُوقُوهُ وَأَنَّ لِلْكَافِرِينَ عَذَابَ النَّارِ ﴿١٤﴾ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا زَحْفًا فَلَا تُوَلُّوهُمُ الْأَدْبَارَ ﴿١٥﴾ وَمَن يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِّقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَىٰ فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِّنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿١٦﴾

﴿ فَإِذَا لَقِيتُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا فَضَرْبَ الرِّقَابِ حَتَّىٰ إِذَا أَثْخَنتُمُوهُمْ فَشُدُّوا الْوَثَاقَ فَإِمَّا مَنًّا بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاءً حَتَّىٰ تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا ۚ ذَٰلِكَ وَلَوْ يَشَاءُ اللَّهُ لَانتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ۗ وَالَّذِينَ قُتِلُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعْمَالَهُمْ ﴿٤﴾ ﴾

هەرکاتێ گەیشتنە بێ باوەڕان بدەن لە گەردنیان‌و شەڕیان لەگەڵدا بکەن هەتا ئەو کاتەی کە کوشتاریان زۆر ئەبێ ئینجا بیانگرن‌و ماوەی دەرچونیان نەدەن جا پاشان ئەو گیراوانەیان هەر بە بەلاش ئازاد بکەن یان لە باتیاندا شت وەرگرن چ پارە بێت یان ئازاد کردنی موسڵمانانی لای دوژمن بێ هەتا ئەو کاتەی شەڕ بن بڕدەکرێت. بڕیاری ﷲ ئەوەیە لە بارەی بێ باوەڕانەوە ئەگەر ﷲ ئارەزۆی لێ بێت هەر بۆ خۆی تۆڵە یان لێ دەسێنێت ، بەڵام ﷲ هەندێکتان بەهەندێکتان تاقی دەکاتەوە ، وەئەوکەسانەی کە کوژراون لە رێگای ﷲ دا ﷲ کردارەکانی ئەوان نافەوتێنێ‌و نائومێدیان ناکات)

لێرەش فەرموی: بێگومان کە ﷲ خاوەنی هێزو توانایی‌و عیزەتە جا ئەو عیزەتەش دەدات بە پێغەمبەران‌و پەیرەوانی راستەقینەیان ، وەلە مەشدا کە دەبێ موسڵمانان ئامادەی گیان فیدایی ببن بەلگەی دانایی ﷲ یە چونکە ئەگەر ئەو ترس‌و تۆیە نەبێ هەموکەس لە دنیادا خۆی بە باوەڕدار دائەنێ‌و پاك‌و پیس لەیەك جیا نابێتەوەو هۆی سەرەکی دنیامان کە تاقی کردنەوەیە نایەتەجێ کەواتە ئەو شەڕو جیهادە پێویستە بۆ تاقی کردنەوەی مرۆڤی راست‌و ناراست کەئەمەش دەمکوتێکە بۆ ئەوانەی کە بەر

فَلَمۡ تَقۡتُلُوهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمۡۚ وَمَا رَمَيۡتَ إِذۡ رَمَيۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ وَلِيُبۡلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡهُ بَلَآءً حَسَنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١٧﴾ ذَٰلِكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُوهِنُ كَيۡدِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٨﴾ إِن تَسۡتَفۡتِحُواْ فَقَدۡ جَآءَكُمُ ٱلۡفَتۡحُۖ وَإِن تَنتَهُواْ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَعُودُواْ نَعُدۡ وَلَن تُغۡنِيَ عَنكُمۡ فِئَتُكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَوۡ كَثُرَتۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَأَنتُمۡ تَسۡمَعُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ قَالُواْ سَمِعۡنَا وَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٢١﴾ ۞ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلصُّمُّ ٱلۡبُكۡمُ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٢٢﴾ وَلَوۡ عَلِمَ ٱللَّهُ فِيهِمۡ خَيۡرٗا لَّأَسۡمَعَهُمۡۖ وَلَوۡ أَسۡمَعَهُمۡ لَتَوَلَّواْ وَّهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٢٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٥﴾

ژەوەندی دەکەن بە هۆی سەرەکیو وەك بتێك دەی پەرستنو بیر لە راستیو دروستی وتارو کرداریان ناکەنەوە ، ئینجا لێرەدا وەك لە پێشەوە ﷲ باوەڕدارانی بەهێزکرد بەشتانێك کەلە توانای ئەواندا نەبو واهەم شتێکی سەیرتر بە باوەڕداران دەکات ئەوە کوفر بەو سوپا گەورەو پڕ چەكو چۆڵەوە هاتوەو ئەمانیش هەم کەمنو هەم کەم چەکن، شتێکی رەوایە کە مرۆڤ لەم جۆرەکاتانەدا زۆر بترسێتو خەوو خواردنی لا نەمێنێ کەچی ئەوان لەم کاتەدا خەو ئەیانباتەوە بەشێوەیەك هەندێك لەوان شەیتانی دەبن ئەوەتە ﷲ دەفەرموێ:

﴿١١﴾ بیر کەرەوە لەو کاتەی کە وەنەوزەگرتنی کە ئەمەش هێوەرکردنەوەیەکی ﷲ بو بۆیانو لەئاسمانەوە ئاوی بۆناردنو باران باری تا پاکتان بکاتەوە بەهۆی ئاوی ئەوبارانەوە لەدڵە راوکێو لەو پیسییەی شەیتان کە توشی لەش پیسی کردبون، وەتا دڵتان سەقامگیرو بەهێزبکات لەسەر راستی رێبازەکەتانو لەسەرخۆو ئارام بنو تا بەوبارانە پێکان بەهێزو وبتەو بکات و لەسەر لاقتان بوەستن. ئەمەش کەی؟

﴿١٢﴾ ئەو کاتەی کە پەروەردگارت وەحی کردە لای فریشتەکانو پێی فەرمون: بڕۆن من بەهێزو یارمەتی لەگەڵتاندامو پشتگیریتان دەکەم دەی ئێوەش باوەڕداران بەهێز بکەن بەم زووانە ترس دەخەمە ناودڵی ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕنو دەیان ترسێنین لە ئێوە جا ئێوەش بدەن لە گەردنیانو چاوتان لێیان نەترسێتو دەستتان بەکامیان دەگات لێیان بدەنو بەزەییتان نەیەت بەو بێ باوەڕو لەخوا نەترسانەدا .

(بنان)سەرئەنگوشتەو جومگەیە واتە لە کاتی شەڕدا دەست پارێزیان لێ نەکەن چونکە ئەوان لە دژایەتی ﷲ و ئایینو پێغەمبەر ﷺو باوەڕداران کۆتاییان نەکردوەو هەرچی تواناییان بووە خەرجیان کردوە. وە دەفەرموێ:

﴿١٣﴾ بۆیە ئەبێ ئاوەهایان لێ بکرێت چونکە ئەوان دژایەتیﷲ و پێغەمبەرەکەیانﷺ کردوەو لە بەرانبەریانەوە وەستاونو رێگای باوەڕهێنانی خەڵکیان گرتوە جا ئەوانەی دژایەتی ﷲ وپێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن نابێ هەروا لەسەریان بچێت ولە سزا رزگاببن ، ئاشکرایە سزای ﷲ یش نابێ وەکو سزای بەندەکانی وابێت بەڵکو سزای ئەو زۆر سەختو بەهێزە وەك دەفەرموێ: بەبێگومان زۆر توندە سزای ﷲ. ئەوەبو لە جەنگی گەورەی بەدرداحەفتا کەس لەتاوانبارانو سەرانی کوفر کوژران کە ئەبو جەهل یەکێك بو لەوحەفتا کەسانەو حەفتا کەسی تریان بەدیل گیرا ، بەراستی تۆڵەی ﷲ سەختەو کەس ناتوانێت بەرگری بکات؟ بەوکۆمەڵەکەمو کەم چەكو چۆڵە ئەو تاغوتانەی بەچۆکدا هێناو پایەو بناغەی کوفری لەرزاند.

﴿١٤﴾ ئائەمە فەرمانی ﷲ یە کە باوەڕداران سەر دەخاتو بێ باوەڕان بەچۆکدا دەهێنێو دەفەرموێ: سا لە دنیادا بیچەژن تۆڵەی ئیشە ناشرینەکانتان ، تۆڵەی ستەمکاریو رێگرتنتان لە ئایینی ﷲو بەبێشك بۆ کافران بێجگە لەو سزای دنیایە لە رۆژی قیامەتدا سزای ئاگریان بۆ هەیە.

﴿١٥﴾ لەم ئایەتەدا ﷲ ئامۆژگاری باوەڕدارانی موجاهید دەکات تا بزانن هەڵوێستیان چۆن بێت لە کاتی هێرشی دوژمندا، لەراستی دا هەروەك ئەوەی کە زاتی خۆی لەمەیدانی جەنگ دا ئامادەبێتو قسە لەگەڵ موجاهیدان دا بکات وایەو دەفەرموێ: ئەی خاوەن باوەڕان کاتێ کە ئێوە گەیشتن بە بێ باوەڕانو هێرشی ئەوانتان هاتەسەرو لەوان نزیك بوونەوە نەکەن پشتی تێ بکەن وراکەنو مەیدان چۆڵ بکەن،

﴿١٦﴾ ئەوسا هەرکەسێ لەو رۆژەدا پشت تێ بکاتو لەو شەڕە رابکات مەگەر بچێتە گۆشەیەکەوە بۆئەوەی شەڕەکەی باشتر پێ بکرێت یان کۆمەڵێك لە موسڵمانان پێویستی بەبەهێزکردن هەبێت بچێت بۆ بەهێزکردنیان مەگەر بۆ ئەم دوانە بڕوات. خۆ ئەگەر رۆیی بەڵام بۆ یەکێ لە دووانە نەبو بەراستی ئەوکەسە غەزەبیﷲ ی بۆ خۆی سازداوەو جێگایشی دۆزەخە، خۆپیسترین جێگایشەئەودۆزەخە. ئەگەر چی هەندێ وتویانە ئەم بڕیارە

تایبەت بو بەشەڕی بەدرەوە بەڵام ڕای کۆمەڵێ زانایان لەسەر ئەوەیە کەئەم ئایەتە بۆ هەمو موسڵمانانە هەتا قیامەتو نابێ لە کاتی دەست پێکردنی شەڕدا موسڵمانان هەڵبێن مەگەر بۆ جێگا گواستنەوە یان خۆگەیاندن بەکۆمەڵێکی تری شەڕکەر یان گەڕانەوە بۆلای پێشەوای موسڵمانان ئەگینا بەو ئیشە دوچاری تاوانێکی زۆر گەورە دەبێت، وەك لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە یەکێك لەو حەوت تاوانە گەورانەی کەدەبنە هۆی لە ناوچونی باوەڕدار سەنگەر چۆڵ کردنو پشت کردنە شەڕە، دیارە موسڵمانێك بەرانبەر دوو کافرە لەشەڕداو ئەمە لە پاشدا دێتو پێچەوانەی ئێرە نیە چونکە ئەوە بۆ ئەو کاتەیە کە شەڕ دەستی پێ نەکردوە وخاوەن باوەڕان لە دووبەرانبەری خۆیان نابێ بترسنو خۆیان لە شەڕ لادەن ئەگەر بەرپەرچێکی تر نەبو. بەڵام پاش دەست پێ کردنی شەڕ نابێ پشت بکاتە شەڕو مەیدان بۆ دوژمن چۆڵ بکات مەگەر بەو مەرجانەی باسیان کرا چونکە بەڵگەی لاوازی بیرو باوەڕە بەهێزی ﷲ ، وە بەدیاری بونی کاتی مردنو پاشو پێش نەکردنیو ئەمەش زۆرلە خۆکردن نیە چونکە ئەوەیش کە باوەڕدار لەگەڵیا ڕووبەرو دەبێتەوە هەر بەشەرێکە وەك ئەو بەڵام باوەڕدار هێزیﷲ یی لەگەڵدایە ئیتر بۆ ئەبێ لەو کاتەدا ڕابکاتو سەنگەر چۆڵ بکاتو ببێتە هۆی شێرا بونی دوژمنو نەترسانی لە باوەڕدارانو لە خۆ بایی بوونیو خۆ بەڕاست زانینی؟ ئینجا ﷲ باسی شەڕەکە دەکاتو دەفەرموێ:

(١٧) ئەی محمد ئێوە ئەوانتان نەکوشت بەڵکو ﷲ کوشتنیو تۆ ئەوانت نەپێکا ئەوکاتەی کەچنگە خۆڵەکەت فڕەدا بەڵام ﷲ فڕەی دایە ناوچاوانی ئەوانەوە، بەڵێ ﷲ ئەمەی کرد هەتا باوەڕداران تاقی بکرێنەوە لەو شەڕەدا بەتاقی کردنەوەیەکی جوان، بێگومان کە ﷲ بیسەری قسەکانتانەو زانەرە بە کردوەکانتان. ئەڵێن پێغەمبەرﷺ هەندێك بەردو لی هەڵگرت کاتێ کە ئەوان هاتنو دوعای کردو فەرموی: {شَاهَتِ الْوُجُوهُ/ا سندرك، صحه الالبا /ناشیرین بێ ئەو ڕوانە}

ئەڵێن هیچ کافرێ لەو کافرانە نەبو مەگەر شتێکی لەو بەرکەوتبێ هەر کەسەی بەچاوی خۆیەوە خەریکبو بەم شێوەیە ترسێکی گەورەیان بۆ پەیدا بو، جا ئەگەر مەیلی ﷲ نەبوایە چۆن ئەو مشتە خۆڵە چاوی ئەو هەموە کافرانەی دەگرتەوەو هەموویان چاویان دوچاری خورانو نارەحەتی دەبوو؟

(١٨) بەڵێ ئاوایە موسڵمانان هەرکاتێ ڕاستو خۆگرو پارێزەری ئاینی ﷲ بن ﷲ دێت بەهانایانەوەو زاڵیان دەکات بەسەر دوژمنانی ئاییندا چونکە بێگومان کە ﷲ لاواز کەری فڕو فێڵی کافرانەو هەرچەندە بەهێزبن هەرلە ناو دەچن موسڵمان تەنها ئەسبابێکە لەدەستی ﷲ دایەو ﷲ بۆ خۆی ئیشەکانی ڕێك دەخاتو دوژمنی پێ لە ناودەبات ، ئەبو جەهل کاتێ کە هات بۆ بەدر دەرگای کەعبەی گرتو وتی خوایە ئەوەی کەحەقە سەری بخەو ئەوەی ناحەقە لەناوی ببە بە خەیاڵی خۆی ئەم دوعایەی دژی پێغەمبەرﷺ کرد، (ﷲ)یش فەرموی:

(١٩) ئەگەر ئێوە لە ﷲ داوا دەکەن کە ڕاستی بەسەر ناڕاستی دا سەرخات، ﷲ نزاکەی لێ وەرگرتن بەڕاستی سەرکەوتن هات بۆ ئەو کەسەی کەشایستەبو کە محمدﷺ و پەیڕەوانی بون چونکە ئەوان ڕاستن جا ئەگەر واز بهێنن لە شیركو دوژمنایەتی ﷲ ئەمە چاکە بۆتان خۆ ئەگەر دووبارە بگەڕێنەوە بۆ دوژمنایەتیو دژایەتیو شەڕکردن ئێمەش دووبارە دەگەڕێینەوە بۆتان بۆ لە ناو بردنو لێدانتانو هیچ سودێکتان لەو پێڕو تاقمەی خۆتان دەست ناکەوێت ئەگەرچی زۆریش بن بەڵکو بە پێچەوانەوە تا زیاتربن زیانی زیاترتان پێ دەگات ، ئینجا پاش هەڕەشەو لاواز نیشاندانی کافران ، باوەڕداران دڵنیا دەکاتەوەو دەفەرموێ: بێگومان کە ﷲ لەگەڵ ئیمانداراندایە کەواتە ئێوە ئەی کافران سەرناکەون بەسەر کەسێکدا کەﷲ ی لەگەڵدا بێ ، جا ئەمڕۆ پێویستە ئیمانداران وا لە خۆیان بکەن کە ﷲ لە گەڵیاندا بێ چونکە ﷲ بەڵێنی داوە لەگەڵ مرۆڤی باوەڕداری خۆگری پەرهیزکاردابێ، دەی ئەمڕۆ ئەگەر خاوەن باوەڕان هیچیان پێ ناکرێت تاوانی خۆیانەو ئەو وەسفانەیان تێدا نیەو نەبوونی ئەو وەسفانەش بوەتە هۆی بەش بەشیو لاواز بونیان هەر بۆیە پاش ئەوەی کە فەرموی ﷲ لەگەڵ باوەڕداراندایە دەفەرموێ:

(٢٠) ئەی باوەڕداران پەیڕەوی ﷲ و پێغەمبەرەکەی بکەنو فەرمانەکانیان جێ بەجێ بکەنو پشتی تێ نەکەن لەحاڵێدا کەئێوە دەبیستنو ئەزانن بۆ چیتان بانگ دەکات.

(٢١) جا ئێوە لەو کەسانە مەبن کە وتیان: بیستمان لە حاڵێکدا کەئەوان تێناگەنو پەیڕەوی فەرمانەکان ناکەن ، واتە ئێوە وەك بێ باوەڕو مونافیقەکان نەکەن کە گوێیان دەگرت بەڵام هیچیان جێ بەجێ نەدەکرد ، ئینجاﷲ ی باڵادەست سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە ﷲ نیعمەتی بیستنو قسەکردنو ژیری پێداون بەڵام ئەوان نەقسەی باش دەبیسنو نەقسەی باش دەکەنو نە ژیری دەخەنە کارەوەو دەفەرموێ:

(٢٢) بێگومان خراپترین شتێك کە بەسەر ئەو زەویەی ﷲ دا بگەڕێت ئەوکەرو لاڵانەن کە عەقڵی خۆیان ناخەنە کارەوەو لە بیستنی شتی ڕاست خۆیان کەڕ کردوەو لە وتنی شتی ڕاستو

وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ تَخَافُونَ أَن يَتَخَطَّفَكُمُ ٱلنَّاسُ فَـَٔاوَىٰكُمْ وَأَيَّدَكُم بِنَصْرِهِۦ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٧﴾ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أَمْوَٰلُكُمْ وَأَوْلَٰدُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ ۚ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ ٱللَّهُ ۖ وَٱللَّهُ خَيْرُ ٱلْمَٰكِرِينَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا قَالُواْ قَدْ سَمِعْنَا لَوْ نَشَآءُ لَقُلْنَا مِثْلَ هَٰذَآ ۙ إِنْ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذْ قَالُواْ ٱللَّهُمَّ إِن كَانَ هَٰذَا هُوَ ٱلْحَقَّ مِنْ عِندِكَ فَأَمْطِرْ عَلَيْنَا حِجَارَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ أَوِ ٱئْتِنَا بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٢﴾ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنتَ فِيهِمْ ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿٣٣﴾

دروست خۆیان لاڵ کردوەو بیر لە هیچ شتێکی چاك ناکەنەوە، مەبەست کافروخوانەناسانە، پیسترین کەسانێکن کەبەسەر ئەم زەوییەدا دەگەڕێن.

﴿٢٣﴾ خۆ ئەگەر ﷲ بچوکترین چاکەی لەناو دڵی ئەواندا بەدی بکردایە تێی دەگەیاندن ، واتە پێویستە هەر ئینسانێك خۆی بۆ چاکەکردن هەنگاو بنێت تا ﷲ یارمەتی بدات ئەوانە هیچ هەنگاوێکی خێریان نەناوە تا ﷲ یارمەتیان بدات وە ئەگەرﷲ خێروچاکەیشی بەوان بگەیاندایەو حاڵی بکردنایە هەر دەستیانقەست پشتیان تێدەکرد لەحاڵێکدا کەئەوان دژایەتی کەرن بۆ ئەم قورئانە ، ئینجا رودەکاتە خاوەن باوەڕان‌و دەفەرموێ:

﴿٢٤﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە وەڵامی ﷲ و وەڵامی ئەم پێغەمبەرەیشی بدەنەوە هەرکاتێك کەبانگتان دەکات بۆ ئەو شتەی کە زیندوتان دەکاتەوە کە قورئانە . واتە پێویستە لە سەرتان بەزووی بەدەم فەرمانەکانی ﷲ و پێغەمبەرەوە بڕۆن‌و خۆتان ماتەڵ نەکەن چونکە هەرشتێك کە ئەوان بەئێوەی دەڵێن مایەی ژیانە بۆتان، ژیانی دنیاو ژیانی دوا رۆژ، جا نابێ سستی‌و تەمەڵی تێدا بکەن تا ﷲ لێتان عاجز نەبێ‌و وازتان لێ نەهێنێ چونکە بەبێ یارمەتی ﷲ کەس هیچی پێ ناکرێت وەك دەفەرموێ: ئاگاداربن بەراستی ﷲ بەهۆی لاساری مرۆڤەوە پەردەیەك دروست دەکات لەنیوان مرۆڤ و دڵیا جا ئەوکاتە هەرچی قسەی بۆ بکەیت سودی لێ وەرناگرێت چونکە ئەو دڵەی کە سەرچاوەی تێگەیشتنە لەو لەشە شاراوەتەوە، ئیترهەرچی قسەی لەگەڵدا بکرێت وەك ئەوەوایە کە قسە لەگەڵ دارو بەردا بکەیت!! وەبێگومان کە ئێوە بەرەولای ئەوزاتە کۆدەکرێنەوە بۆ وەرگرتنی پاداشتی کردارەکانتان. بەراستی پێویستە کەخاوەن باوەڕان بترسن‌و زۆر ئاگاداری دڵەکانیان بن‌و ئیشی وانەکەن کە ﷲ ئەو دڵ‌و فەهمەیان لێ بشارێتەوە لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی ئەحمەد بۆمان دەگێرێتەوە هاتوە کە پێغەمبەرﷺ زۆرجار دەیفەرمو:{ يَا مُقَلِّبَ الْقُلُوبِ ثَبِّتْ قَلْبِي عَلَى دِينِكَ.. إِنَّ الْقُلُوبَ بَيْنَ أُصْبُعَيْنِ مِنْ أَصَابِعِ اللهِ يُقَلِّبُهَا كَيْفَ يَشَاءُ / مسلم وغ ه /ئەی گۆڕەڕی دڵەکان دڵم دامەزرێنی لەسەر ئایینەکەی خۆت .. هەروەها فەرمویەتی: بێگومان کەدڵەکان لەنێوان دوو ئەنگوشتن لە ئەنگوشتەکانی ﷲوچۆن ئارەزۆ بکات ئەم دیو دیوی پێ دەکات.

ئەبو سەعیدی کوڕی موعەللا دەڵێت: لەمزگەوتدا نوێژم دەکرد پێغەمبەرﷺ بانگی کردم، منیش وەڵامم نەدایەوە لەپاشدا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەنوێژدا بووم فەرمووی:{ أَلَمْ يَقُلْ اللهُ اسْتَجِيبُوا لِلهِ وَلِلرسُولِ إِذَا دَعَاكُمْ لِمَا يُحْيِيكُمْ ثُم قَالَ لِي لَأُعَلِّمَنكَ سُورَةً هِيَ أَعْظَمُ السوَرِ فِي الْقُرْآنِ قَبْلَ أَنْ تَخْرُجَ مِنْ الْمَسْجِدِ ثُم أَخَذَ بِيَدِي فَلَما أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ قُلْتُ لَهُ أَلَمْ تَقُلْ لَأُعَلِّمَنكَ سُورَةً هِيَ أَعْظَمُ سُورَةٍ فِي الْقُرْآنِ قَالَ الْحَمْدُ لِلهِ رَب الْعَالَمِينَ هِيَ السبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ الذِي أُوتِيتُهُ/ الترمذي، النسائي، صحح الألبا / ئەی ﷲ نەیفەرموە وەڵامی خوداو پێغەمبەر ﷺ بدەنەوە هەرکاتێ کە بانگی کردن بۆ لای ئەوەی کەزیندوتان دەکاتەوە؟ پاشان پێی فەرموم: بەدڵنیاییەوە پێش ئەوەی کە دەرچیت لە مزگەوتداسورەتێکت فێردەکەم کە گەورەی هەمو سورەتەکانی قورئانە پاشان دەستی گرتم جاپێش ئەوەی کە دەربچێت پێم وت: ئەی تۆ نەتفەرمو کە سورەتێکت فێردەکەم کە گەورەی هەمو سورەتەکانی قورئان بێت؟ فەرموی: (الْحَمْدُ لِلهِ رَب الْعَالَمِينَ ) کەئەوحەوتەیە کە دووبارە دەکرێتەوەو ئەوقورئانە گەورەیە کە پێم دراوە}

﴿٢٥﴾ وەخۆتان بپارێزن لە تاوان‌و خراپەو بت پەرستی چونکە ئەگەر ﷲ سزای نارد تەنها ئەوانە ناگرێتەوە کەتاوان‌و خراپەو بت پەرستیان کردوە بەڵکو سزا هەمویان دەگرێتەوە لە دنیادا هەرچەن لە پاشە رۆژدا هەرکەس بەگوێرەی کرداری خۆی ئیشی لەگەڵدا دەکرێت.

وشەی(فِتْنَةً ) بەمانای بەڵاو تاقی کردنەوەو هاوەڵ دانان هاتوە کەبە هەرسێ ماناکە لێرە دەگونجێ بەڵام مانای سێهەمم بەلاوە

نزیك ترە ، بەبت پەرستی مانام کردوە چونکە بت پەرستی جۆری زۆرەو هەمویشی هاوڵ دانانە بۆ ﷲ چ ماڵ پەرستی بێ یان شەخس پەرستی، مەقام پەرستی بێ یان تاقمو گروپ پەرستی ، حەیوان پەرستی بێ یان مرۆڤ پەرستی، شەیتان پەرستی بێ یان فریشتە پەرستی، هەمویان هەر بت پەرستین‌و خاوەنەکەی بێ باوەڕو کافر دەبێ‌و سزاکەی دنیایشی تایبەتی خۆی نیە بەڵکو بێ تاوانیش دەگرێتەوە، وەبزانن بەبێشك کە ﷲ تۆڵەی زۆر سەختە. سەیرە تاوانبار وەختێ ئەو تاوانە گەورانە دەکات‌و پیاوانی باش ئامۆژگاریان دەکەن دژایەتی‌و قسەی ناشیرینیان پێ دەڵێن‌و دەڵێن: ئێمە بۆ خۆمان سەربەخۆین‌و کەس مافی ئەوەی نیە کە ڕێمان لێ بگرێت؟! ئیتر چونکە ژیری کارناکات بیر لەوە ناکاتەوە کە کابرای ئامۆژگاری کەریش هەر مرۆڤە وەك ئەوو ئەویش ئەبێ ئازاد بێ لە بەرگری کردنی شتێك کە زیانی پێ بگەیەنێ، پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: سوێند بەوکەسەی کەگیانی منی بەدەستە فەرمان دەکەن بەچاکەو بەرگری دەکەن لە خراپە ئەگینا نزیکە ﷲ لەلایەن خۆیەوە سزاتان بۆ ڕەوانە بکات لەپاشان بپاڕێنەوە لێی بەڵام ئەو وەڵامتان نەداتەوەو هەرلەناو ئەو سزادا بمێننەوە ، وەك ئەمڕۆ کە هەمو مرۆڤ بەچاك‌و خراپیەوە لەناو ناخۆشی‌و کوشتن‌و بڕین‌و تاڵانکردندایەو ڕۆژانە بەملیونەها پاڕانەوەو نزا دەکرێت بەڵام ﷲ وەڵامی کەس ناداتەوە ، بەراستی تۆڵەی ﷲ سەختە. ئینجا ﷲ باسی یەکێ لە نیعمەتە فرەوانەکانی دەکات سەبارەت بە موسڵمانانی ئەو سەردەمەو دەفەرموێ:

(٢٦) دەی بیر بکەنەوە لەو کاتەی کە ئێوە کەم بوون کە ژێر دەستەو لاواز کرابون لەسەر زەویداو هیچ نرخێکیان بۆ دانەدەنان ئەوە بو لە مەکەدا تانەیان لێ دەدان‌و گاڵتەیان پێ دەکردن‌و لێیان دەدان، وەئێوە دەترسان کە خەڵکی هێرشتان بێننەسەرو پارچەپارچەتان بکەن ، (**خطف**) بەمانای فڕاندن‌و ڕاکێشانی بەپەلەیە. ئەوەبو ﷲ جێگەی پێ دان‌و لە مەدینەدا جێگیری کردن‌و بەهێزی کردن‌و یارمەتی دان لەلایەن خۆیەوە، وە لەشتی پاك‌و خاوێن ڕۆزی پێدان واتە ئەو تەنگانەی خۆتان لە بیر مەبەنەوەو تەماشای ئەو نیعمەتە فرەوانەی ﷲ بکەن بەڵکو ئێوەش شوکری نیعمەتی ﷲ بکەن چونکە پەروەردگارتان شوکری پێ خۆشەو بەشوکر نیعمەتەکانی خۆی زیاد دەکات، ئینجا داوایان لێ دەکات کە خیانەت نەکەن‌و دەفەرموێ:

(٢٧) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە خیانەت نەکەن نەلەگەڵ ﷲ دا و نە لەگەڵ پێغەمبەرداو هەرچیتان پێ دەسپێرن بەرێك‌و پێکی ئەنجامی بدەن‌و لەو ئەمانەتانەی کە بەسەرتانەوەیە وەکو نوێژو زەکات‌و ڕۆژو حەج‌و جیهادو باقی فەرزەکانی تر خیانەت نەکەن‌و بەرێك‌و پێکی ئەنجامیان بدەن لەحاڵێکدا کەئێوە خۆتان دەزانن کە خیانەت شتێکی ناپەسەندەو مایەی سەرشۆڕی‌و شەرمەندەیی مرۆڤە هەر لە دنیادا چ جای دوا ڕۆژ . خۆدەشزانن کە پێغەمبەرەکەتانﷺ خیانەتی بە نیشانەیەکی مونافیقی داناوە، ئینجا دەفەرموێ:

(٢٨) جا بزانن کە ماڵ‌و منداڵ تاقی کردنەوەیە بۆ ئێوە واتە ئەوەی کە ماڵی پێ نادات تاقی دەکاتەوە تابزانرێت چەند خۆگرەو ڕازیە بەبەشی ﷲ ، وەئەوەی کە پێی دەدات تا بزانرێت چۆن ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکات‌و چۆنیان پەروەردە دەکات، ئایا بەو منداڵ‌و ماڵە سوپاسی ﷲ دەکات یان لوت بەرز دەبێ‌و لە پێستی خۆی دەردەچێت ، ئایا ئەو ماڵ‌و منداڵەی بۆ پەرە پێدانی ئایین‌و خوورەوشتە یان بۆدژایەتی ئایین‌و بێ بەندوباریە ، ئایا ئەم ماڵ‌و منداڵە گوڕو تینی زیاتر دەکەن لەسەر ئایین‌و جیهاد لە پێناوی دا یان بەهۆی پاراستن‌و خۆش ویستنیانەوە لە ئایین دور دەکەوێتەوەو واز لە جیهاد دەهێنێت؟ بەڵێ ﷲدەفەرموێ: ماڵ‌و منداڵ بۆ تاقی کردنەوەی مرۆڤەو لەزەتێکی کەمە بەڵام ئەوەی بۆ ﷲ بێت ئەوە چاکەو هەر ئەوە دەمێنێتەوە ، وەبەبێگومان لەلای ﷲ هەیە پاداشتی گەورە. بەڵێ پێویستە خاوەن باوەڕان خۆشەویستی ﷲو پێغەمبەریانﷺ لەلا لە هەموشت زیاتر بێ وەك لەم فەرمودەدا دەفەرموێ:{ لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتى أَكُونَ أَحَبّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِ ـ /متفق عليه/ سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە باوەڕی نیە هیچکام لە ئێوە هەتا منی لەلا خۆشەویست تر نەبێت لە گیانی خۆی‌و ماڵی‌و هەموخەڵك}

جا با خاوەن باوەڕان تەماشای ئەم فەرمودە بکەن‌و تەماشای ناو دەرونی خۆیشیان بکەن ئەوسا تەماشا بکەن‌و بزانن ئایاخۆیان دەبیننەوە لەناو کۆمەڵی باوەڕدارانی ڕاستەقینەدا ؟! جائەگەر خۆیان نابیننەوە باخۆیان لۆمەی خۆیان بکەن. ئینجا دەرگای هەمو خێرو چاکەیەکمان پیشان دەدات‌و دەفەرموێ:

(٢٩) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر لەﷲ بترسن‌و خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە ئەبێتە هۆی تورەی‌و رقی ئەوزاتە، ﷲ جیاکەرەوەتان پێ دەدات واتە ئەگەر تەقواتان بو ﷲ شتێکی وا دەخاتە ناو دڵ‌و مێشکتانەوە کە هەمیشە بتوانن چاکەو خراپە لەیەك جیابکەنەوە ، بەڵێ بەراستی تەقوا هۆی بەختەوەری هەردوو دنیایی مرۆڤە ئەوەتە لە دنیادا بەرچاوی ڕۆشن دەکرێتەوەو پاشە ڕۆژیش ﷲتاوانەکانتان دادەپۆشێت‌و لێتان خۆش دەبێت، بەراستی ﷲ خاوەنی بەهرەو چاکەی گەورەیەو پەرهیزکاران بەشی گەورە دەبەن . لە سورەتی تەلاقدا

وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ ٱللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ وَمَا كَانُوٓاْ أَوْلِيَآءَهُۥٓ ۚ إِنْ أَوْلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ لِيَمِيزَ ٱللَّهُ ٱلْخَبِيثَ مِنَ ٱلطَّيِّبِ وَيَجْعَلَ ٱلْخَبِيثَ بَعْضَهُۥ عَلَىٰ بَعْضٍ فَيَرْكُمَهُۥ جَمِيعًا فَيَجْعَلَهُۥ فِى جَهَنَّمَ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٣٧﴾ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَنتَهُواْ يُغْفَرْ لَهُم مَّا قَدْ سَلَفَ وَإِن يَعُودُواْ فَقَدْ مَضَتْ سُنَّتُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ وَقَٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ ۚ فَإِنِ ٱنتَهَوْاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٣٩﴾ وَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَوْلَىٰكُمْ ۚ نِعْمَ ٱلْمَوْلَىٰ وَنِعْمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٤٠﴾

بەشێکی تر لە سودەکانی تەقوا باسکراوە چاك وردببنەوە لێی مایەی خۆش بەختیە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

﴿٣٠﴾ ئەی محمد ﷺ جا بیر بکەرەوە لەوکاتەی کە کافران پیلانیان دەگێڕا دژی تۆ بۆ ئەوەی بەندت بکەنو لە زیندانت کەن تا دەمریت ، یان بتکوژن، یان دەرت بکەن، ئەوان پیلانی خۆیان دەگێڕن و ﷲ یش پیلانی خۆی دەخاتەکار، لەکاتێکدا ﷲ چاکترینی هەموو پیلانسازو نەخشە سازانە.

بەڵێ ئەوان هەمیشە بەردەوامن لە فروفێڵ کردنداو ﷲ یش هەمیشە پەکیان دەخاتو نایەڵێ پیلانیان سەربگرێ و شەرمەندەو رسوایان دەکات جا لە هیچ فرو فێڵێکیان دا سەرکەوتو نابن چونکە ﷲ زاناترو ئاگادارترو بەهێزترە لە هەمو فێڵبازان.

وەسفی چاکترینی فێڵ بازان بۆ ﷲ هەیە بەڵام ئەبێ بزانین، وەسفەکەی ﷲ وەك وەسفی ئێمە نیەو نیازی بەوەسفی مرۆڤ نیە چونکە مرۆڤ بۆیە فێڵو فڕ دەکات چونکە جورئەتی روبەڕوبونەوەی راستەقینەی نیەو دەترسێت شکست بخوات بەڵام ﷲ لەکەس ناترسێت تا فێڵو فڕ بکات بەڵام چۆن فروفێڵی فێڵبازان بەزۆری نازانرێت تا ئەنجام دەدرێت، دەی تۆڵەی ﷲ یش هەرواکەس پێی نازانێت تا روودەدات ئەم مانایەم بەلاوە رۆشنترە

لەوەی بڵێین بۆ هاوچەشنی وشەکانە بەڵێ، ئەوان فروفێڵیان کرد بەڵام ﷲ ی بەدەسەڵات فرو فێڵەکەی ئەوانی هەڵوەشاندەوەو لە ئاکامدا پێغەمبەرﷺ سەرکەوتو ئەوان شکستیان خوارد. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٣١﴾ ئەوسا هەرکاتێ کە نیشانەکانی ئێمە بخوێندرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن: شتی وامان بیستوە مەبەستیان چیرۆكو داستانەکانی کۆن بو و دەیان وت: ئەگەر ئارەزۆ بکەین ئێمەش وەك ئەوە دەڵێین ، دەڵێن نەفەرێك بەناوی نەزری کوڕی حاریسەوە ئەم قسەیەی کردوە جا ئەم ئایەتە لەبارەی ئەووەوە هاتوتە خوارەوە لەپاشدا لە بەدرا گیرا پێغەمبەرﷺ فەرموی: بیکوژن، میقداد گرتبوی وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ ئەوە گیراوی منەو چەند جارێك وتیەوە پێغەمبەریش فەرموی: خوایە میقداد بێ نیاز بکە لە بەرەکەتی خۆت، میقدادیش وتی: من ئەمەم ویست، وەئەمە قسەی ئەووەو دەیوت: "ئەمەی کە محمد ﷺدەیخوێنێتەوە بێجگەلە قسەی پڕو پوچی کۆن شتێکی تر نیە" جا لەباتی ترسان لە ﷲ داوای سزای دەکرد وەك قورئان دەفەرموێ:

﴿٣٢﴾ باس بکە ئەی محمدﷺ ئەو کاتەی کە وتیان: خوایە ئەگەر ئەمە حەقەو راستە لەلایەن خۆتەوەیە سا لەئاسمانەوە بەرد بارانمان بکە یان سزایەکی دەردناکمان بۆ بنێرە ؟!! بەڵام خوای میهرەبان دەفەرموێ:

﴿٣٣﴾ خۆ ﷲ سزایان نادات هەتا تۆ لە ناویاندابیتو ﷲ سزایان نادات مادام ئەوان داوای لێ خۆشبون لە ﷲ بکەن. واتە نەهاتنی سزا لەبەر چاکی ئەوان نیە بەڵکو لەبەر خاتری بونی تۆیە لە ناویانداو ﷲ دوو شتی کردوە بە هۆی نە هاتنی سزا بۆ ئەم گەلە، **یەکەمیان**: بونی پێغەمبەرمانﷺ لەناو خەڵکدا کە ئەمەیان بەماڵ ئاوای پێغەمبەرمانﷺ کۆتایی پێ هاتوە،

**دووهەمیان**: پەشیمان بوونەوەو گەڕانەوە بۆلای ﷲ کەئەمە تا خۆر لە رۆژ ئاواوە دەگەڕێتەوە دەمێنێت، دەی ئایا بێ نەمەکیو سپڵەیی نیە کە ئێمە ئەو پەروەردگارە میهرەبانە نەپەرستین کەئەوەندە بەسۆزەبۆمان؟ پاشان ﷲ تۆڵەی لە ئەوانەی مەکە وەرگرتەوە وەك دەفەرموێ:

﴿٣٤﴾ بۆدەبێ ئەوانە ﷲ سزایان نەدات لە حاڵێکدا کە ئەوان رێگای ماڵیﷲ یان گرتوەو نایەڵن تۆ ئەی محمدﷺ و موسڵمانان بچنە ناویەوە؟ وەئەوان دۆستیﷲ نین، دۆستەکانی ﷲ هەر پەرهیزکارانن، بەڵام زۆربەی ئەوان نازانن‌و پێیان وایە کە خۆیان چاکترین کەسن سەبارەت بە ﷲ و پارێزگاری کردنی ئایین. جا

پێشەکی ﷲ فەرموی: سزایان نادەم مادام تۆ لە ناویاندابیت یان پەشیمان ببنەوە ، دەی وا پێغەمبەریان ﷺ دەرکردو پەشیمانیش نەبونەوە بەڵکو ڕێگای ماڵی ﷲ یشیان گرتو ماوە نادەن کە موسڵمانان بچنە ناویەوەو خۆیان بەدۆستی ﷲ دەزانیو پێغەمبەرﷺ و موسڵمانانیان بەدوژمنی ﷲ دادەنا، ﷲ یش بەم شێوەیە دای بەناودەمیانداو وتیی گەیاندن کە ئەوان دۆستی ﷲ نینو مافی ئەوەیان نیە بەناو(ﷲ) وە دوژمنایەتی ئەو ئایینەو پەیڕەوانی بکەن. ئینجا ﷲ سەبارەت بە بەندایەتیە ڕواڵەتیەکانیان دەفەرموێ:

(٣٥) نوێژێك کە ئەوان دەیکەن لەلای بەیتا هیچ نیە بێجگەلە فیکە لێدانێكو چەپڵە کوتانێك واتە هیچ نرخێکی نیەو پاداشتیان نادرێتەوە بەڵکو سزایشی لەسەر وەر دەگرن دەسا بچەژن سزا بە هۆی ئەوەی کە ئێوە بێ باوەڕو کافرن بە بەرنامەی ﷲ. لێرەدا دەر دەکەوێت کە بەندایەتی ﷲ بەو مەرجە ڕاستو دروستە کە ڕێكو پێك بێت لەگەڵ شەریعەتی ﷲ دا ئەگینا هیچ نرخێکی نیە ئەمەش هەڕەشەیەکی زۆر توندە بۆ ئەو کەسانەی کەیاساکانی ئیسلام بەرێكو پێکی وەرناگرنو ئایین تێکەڵاو بەشتی پڕو پوچی وەك دەفو هەڵقونکەو هاواری ئەمو ئەو دەکەنو ناوی دەنێن ﷲ پەرستیو ڕێگای ڕزگار بون. ئەمانە کە ﷲ سەرکۆنەو هەڕەشەو سزای گەورەی بۆ باسکردون، ئەوکەسانە بون کە خزمەتی ماڵی ﷲ یان دەکردو ئاوو خۆراکیان بۆ حاجیان ئامادە دەکرد ، بەڵام پەیڕەوییان لە پێغەمبەرﷺ نەدەکرد. دەی وازهێنانی ئێمە لەوهەمو فەرزو سوننەتانەوە سەرگەرم بوونمان بەو هەمو ئیشە ناڕەواو پڕو پوچو بیدعەو داهاتوانە، پەیڕەوی پێغەمبەرمانە ﷺ ؟! کابرای پێش نوێژو خوتبە خوێنی خەڵك سەدان بێ شەرعی تێدایە هەرلە ڕیش تاشینەوە تا جگەرە خواردنو پەیڕەوی بەرنامەی غەیری ئایینوئەنجامدانی دەیان بیدعە ، کەچی لەسەر ئەوەی کەلاوێکی تازە پێگەیشتوی کەم حاڵیو مێوانی ماڵی ﷲ سوننەتێکی پێغەمبەرمانﷺ ئەنجام دەدات بەتوندی هێرش دەکاتە سەریو بگرە بەنا موسڵمانیشی ناو ببات !! جا ئەمەو ئەوانەی خزمەتچی ماڵیﷲ ی سەرەتای ئیسلام چییان فەرقە؟! ئەی مەردم بیر بکەنەوەو واز لەو جۆرە ڕەفتارە بهێننو پەیڕەوی پێغەمبەرمان ﷺ بکەنو دەسەڵاتو هێز سەر ئەنجامی شکانو لە ناو چونە وەك ﷲ مژدە بە خاوەن باوەڕان دەداتو دەفەرموێ:

(٣٦) بێگومان ئەوانەی کە کافرن ماڵەکانی خۆیان دەبەخشن تا ڕێگای بڵاوبونەوەی ئایینی ﷲ بگرن بەم زوانە ئەو ماڵە دەبەخشنو کۆتایی ناکەنو دەیانەوێ ئایین لە ناوبەرن بەڵام لەپاشا دەبێتە خەفەتو داخ بۆیان، بۆ؟چونکەزۆرنابات شکست دەخۆنو سەروەتو سامانەکەشیان بەهەدەر دەڕواتو ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕبون لە ڕۆژی دواییدا کۆدەکرێنەوە بۆ دۆزەخو سزاکەی. بەڵێ ﷲ ماڵ وسامانی زۆر دەدات بە بێ باوەڕان بۆ دژایەتی باوەڕداران، بۆچی؟

(٣٧) تا ﷲ پیس لە پاك جیا بکاتەوەو خراپەکان هەندێکیان بەهەندێکی تریانەوە پاڵ بداتەوە ئەوسا هەمویان لەسەر یەك کەڵەکە دەکات ، ئینجا دەیانخاتە ناودۆزەخەوە. واتە بەهۆی زۆری سامانو ماڵو هێزی بێ باوەڕان پیس لە پاك جیا دەکاتەوە چونکە لەسەرەتادا زۆر کەس لافی باوەڕ لێ دەداتو خۆی بەموسڵمان دەژمێرێت بەڵام لە وەختی ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ ئەوماڵو سامانو هێزەی بێ باوەڕاندا ڕیزی باوەڕداران بەجێ دێڵێت بۆتەماع یان لە ترساو دەچێتە ناو ئەو بێ باوەڕانەوە تەنها مرۆڤە ڕاستو پاکەکان دەمێنێنەوەو خراپان هەمویان یەك دەگرن، واتە دەسەڵاتو هێزی بێ باوەڕان تاقی کردنەوەیە بۆ باوەڕداری ڕاستو ناڕاست ، ڕاستەکان پشت دەبەستن بە ﷲ و دەزانن سەرکەوتن بەدەست ﷲ یە نەبە زۆرو کەمی چەكو چۆڵە جا بتەوتر دەبن لە سەر ئایینەکەیان بەڵام ترسنۆکانو هەلپەرستان دەترسنو بۆ پاراستنی خۆیان بەزووی خۆیان دەدەنە پاڵ بێ باوەڕانەوەو ئەمەش بە ژیرانەو بەکردارێکی بەسودی دەزانن بەڵام ﷲ دەفەرموێ: بەراستی ئەوانە زیان لێ کەوتوو ڕەنجەڕۆن . بەڵێ کاتێ سەرئەنجامو پاشەڕۆژی کافری دیاری کردو فەرموی ئەیانخەمە دۆزەخەوە واجارێکی تر هەلیان بۆ دەرەخسێنێ بەڵکو لەو سزایە خۆیان ڕزگاربکەنو دەفەرموێ:

(٣٨) ئەی محمدﷺ بەوانەی کە بێ باوەڕو کافرن بڵێ: ئەگەر واز بهێنن لە کوفرو فەسادو بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگای ﷲ چاو پۆشی دەکرێت لەو تاوانو خراپانەی کەلە پێشەوە کردویانەو ئەگەر دیسان بگەڕێنەوە بۆ فەسادو کوفرو تاوان ئەوا ڕەوشتی پێشوان ڕۆیشتوە کە هەمیشە شکانو لەناوچوونی بێ باوەڕان بوە ، ئینجا ﷲ داوا لە باوەڕداران دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٩) جا شەڕیان لەگەڵدا بکەنو لێیان بدەنو نەترسن لە هێزو توانایان هەتا بت پەرستیو ئێشو ئازاردانی موسڵمانان نامێنێتو تا ئەوکاتەی کە تەواوی بەرنامەی مرۆڤ بەرنامەی ﷲ دەبێت جا ئەگەر هاتو ئەوان وازیان هێنا پێویستە موسڵمانانیش وازیان لێ بهێننو هەوڵی بشکنینی بیرو باوەڕیان نەدەنو بیانسپێرن بەﷲ چونکە بێگومان ﷲ بەوەی کە ئەوان دەیکەن بینەرە. بەڵێ پێویستە لەسەر موسڵمان هەتا موسڵمانێك ئازار بدرێتو هەتا شیرك لەسەر زەویدا هەبێت شەڕبکەن ئاشکرایە کوفریش هەتا

۞ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَىْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُۥ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ إِن كُنتُمْ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا يَوْمَ ٱلْفُرْقَانِ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٤١﴾ إِذْ أَنتُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلدُّنْيَا وَهُم بِٱلْعُدْوَةِ ٱلْقُصْوَىٰ وَٱلرَّكْبُ أَسْفَلَ مِنكُمْ ۚ وَلَوْ تَوَاعَدتُّمْ لَٱخْتَلَفْتُمْ فِى ٱلْمِيعَـٰدِ ۙ وَلَـٰكِن لِّيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا لِّيَهْلِكَ مَنْ هَلَكَ عَنۢ بَيِّنَةٍ وَيَحْيَىٰ مَنْ حَىَّ عَنۢ بَيِّنَةٍ ۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَسَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٤٢﴾ إِذْ يُرِيكَهُمُ ٱللَّهُ فِى مَنَامِكَ قَلِيلًا ۖ وَلَوْ أَرَىٰكَهُمْ كَثِيرًا لَّفَشِلْتُمْ وَلَتَنَـٰزَعْتُمْ فِى ٱلْأَمْرِ وَلَـٰكِنَّ ٱللَّهَ سَلَّمَ ۗ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٤٣﴾ وَإِذْ يُرِيكُمُوهُمْ إِذِ ٱلْتَقَيْتُمْ فِىٓ أَعْيُنِكُمْ قَلِيلًا وَيُقَلِّلُكُمْ فِىٓ أَعْيُنِهِمْ لِيَقْضِىَ ٱللَّهُ أَمْرًا كَانَ مَفْعُولًا ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرْجَعُ ٱلْأُمُورُ ﴿٤٤﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُوا۟ وَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾

زەوی هەبێ هەر دەمێنێ کەوابو جیهاد هەرگیز کۆتای پێ نایەت وەك وتراوە: {الجهاد ماضٍ إلى يوم القيامة/ جیهاد هەتا کۆتایی ئەم جیهانە دەمێنێت}

﴿٤٠﴾ خۆ ئەگەر پاش گەز بوونەوەو دووبارە دەستیان کردەوە بە شەڕو دژایەتی کردنی ئایینی الله و موسڵمانان ئێوەش لە پشتی الله پەلەماریان بدەنو تارو ماریان بکەنو هیچ ترسێك نەخەنە دڵی خۆتانەوە چونکەالله یارمەتی دەرو سەرپەرستو دۆستی ئێوەیە دەسا ئێوە ئەی باوەڕداران چاك بزانن کە بەبێگومان الله دۆستو سەرپەرشتی ئێوەیە بەراستی چاکترین دۆستو سەرپەرشتەو باشترین یارمەتی دەرە. ئائەمەیە داخوازی ئەم ئایینەو پێویستە باوەڕدار بجوڵێت هەتا دەسەڵاتی پەروەردگاری عالەم لەناو عالەمدا دەچەسپێنێ چونکە ئەم ئایینە نەهاتوە بۆ گاڵتەو گەمەو نەهاتوە تەنها خەڵکی فێری زانیاری جۆراو جۆربکات یان تەنها بەندایەتیەکی نێوان الله و بەندەبێت بەڵکو ئەم ئایینە بەندایەتیە، حکومەتە، ئاشتیە، جیهادە، دنیایە، دوارۆژەو رزگار کەری مرۆڤە لە بەندایەتی کردنی مرۆڤ بۆ بەندایەتی الله ی تاكو تەنیاو خاوەنی ئاسمانانو زەویو مرۆڤو هەمو بونەوەرە واتە دژایەتی کردنی ئەم ئایینە بۆ نەزانیو نەفامی قسەیەکی بێ ناوەرۆك نیە بەڵکو حەقیقەتێکی رۆشنو ئاشکرایەو دەبێ ئاوەها کاری لەگەڵدا بکرێت ئەگینا چ مانایەکی ترمان پێ دەدات ئەم ئایەتە؟ ئەوەتە بەدوای ئەوەدا کە فەرموی شەڕیان لەگەڵدا بکەن هەتا لانەی شەڕو خراپەو فەساد بەتەواوی تارو مار دەکرێتو بەرنامە تەنها بەرنامەیالله دەبێ، فەرموی چاك بزانن کە الله دۆستو سەرپەرشتی ئێوەیە کەسێك ئاوا سەرپەرشتو دۆستێکی هەبێت بێگومان هەمیشە پاشەڕۆژ هەرهی ئەو دەبێو سەروەتو سامانی دوژمنان بۆ ئەو دەگەڕێتەوە، ئەوەتا هەر بەدوای ئەم دوو ئایەتەدا باسی دەسکەوتەکانی جیهادو چۆنیەتی دابەشکردنەکەیمان بۆدەکاتو دەفەرموێ:

﴿٤١﴾ جا بزانن ئەوەی کە ئێوە دەستان دەکەوێت لە کافرانەوە بەشێوەی غەنیمەت. جیاوازی غەنیمەتو فەیئ ئەوەیە کە غەنیمەت بەوماڵە دەڵێن کەبەهۆی جیهادو شەڕەوە لەکافرانەوە بکەوێتە دەست موسڵمانان "فەیئ" یش ئەو ماڵەیە کە بە بێ شەڕ دەکەوێتە دەست موسڵمانان ئەم ئایەتەی ئێرە باسی یەکەمیانەو باسی فەیئیش لە سورەتی حەشردا دەکرێت، جا لێرەدا دەفەرموێ: دابەشکردنی بەم شێوەیە: چواربەش لە پێنج بەشی دەدرێت بە جەنگاوەرانو یەك بەشی لەو پێنج بەشەیش دابەش دەکرێت بەسەر ئەم پێنج لایەنەدا جابەبیگومان پێنج یەکی ئەو غەنیمەتە هی الله یەو دەدرێت بەپێغەمبەرو خزمانی پێغەمبەرﷺ کە کوڕانی هاشمو کوڕانی موتەللیب دەگرێتەوەو بەهەتیوانو بەنەداران ، وەدەدرێت بە رێبوارانێ کەلە رێگادا پارەیان لێ دەبڕێ ، بەڵێ ماڵی دەست کەوتو لە کافرانەوە بەشەڕ ئاوا دابەش دەکرێت، جا ئیتر ئەوانە ماون هەموویان یان نەماونو چۆن دابەش دەکرێت، وە ئەوەی پێغەمبەرﷺ بەکێ دەدرێتو دەیان پرسیاری تر بچۆ لە پەڕاوەفیقهیەکاندا تەماشای بکەو چوونە ناو ئەو کێشە فیقهیەیانە بە بیرو رای من تامو چێژی ئایەتەکە کەم دەکاتەوەو وام پێ چاکە ئەو مەسئەلە خیلافیانە تا بکرێت باس نەکرێت لەمانای قورئاندا جا کەسێك کە دەیەوێت شارەزابببێت با بچێتە سەر پەڕاوە فیقهیەکانو تەماشای ئەوان بکات، الله جەزای بەخەیری زانایانی پێشومان بداتەوە بەراستی گەورەو بچوکیان تۆمارکردوە. جا فەرموی: ئاوەها دابەش دەکرێت ئەگەر باوەڕتان بە الله و بەو قورئانەی کە رەوانەمان کردوەتە لای بەندەی خۆمان کە محمدﷺ هەیە کەرێکەوتی رەوانەی کردنەکەی لە رۆژی جیاکردنەوەی حەق لە ناحەقدا بوە کە رۆژی جەنگی بەدرە کە حەڤدەی رەمەزانی ساڵی دووهەمی کۆچی بو، وە ئەو رۆژەی کە هەردوو کۆمەڵکە دایان لەیەك واتە موسڵمانانو کافران لەبەدردا. خۆ الله دەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە ، ئەوەتە ئەو کۆمەڵە کەم هێزەی سەرخست بەسەر ئەو کۆمەڵە بەهێزەدا جا هەروەك لە پێشەوە وتمان ئەم سورەتە پاش تەواوبونی جەنگی بەدر هاتوتە خوارەوە بۆ

پێغەمبەرمانﷺ و بەدرێژی ئەو جەنگە گەورەو پیرۆزەو رووداوەکانی باس دەکات دیارە هەندێکی رۆیشتو ئەمەی لەمەولایش باسی هەندێکی تریەتی جا لێرەدا ﷲ جێگای دانیشتنی هەردوو کۆمەڵەکە دیاری دەکات بۆ قورئان خوێنان‌و دەفەرموێ:

﴿٤٢﴾ بیر کەرەوە لەو کاتەی کە ئێوە لەلایەکی نزیکی مەدینەوەبون‌و ئەوانیش لەلایەکی دووری مەدینەوە بون ئەو قافڵەیەش کە ئێوە بۆی چون لە خواروی ئێوەوە بو لە کەناری دەریا، وەئەگەر ئێوە بەڵێنتان بەیەکتر بدایە بۆ ئەو جێگایە نە ئەوان دەهاتن‌و نە ئێوەش، ئێوە دەتان وت: ئێمە کەمین‌و چاری دوژمن ناکەین‌و ئەوانیش دەیان وت: دورەو ئێمە ناگەینە ئەو جێگایەو چەندین بەڵگەو بەهانەی تر بەڵام بۆ ئەوەی ﷲ جێ بەجێی بکات ئیشێك کە ئەو ئیشە ئەنجام دراوە لە زانیاری ئەودا، واتە ﷲ خۆی لە کۆنەوە ئەو قەرارەی داوە کە ئەو جەنگە لەوێدا ببێ‌و ئەو کۆمەڵە لاوازە سەربخات‌و ئەو ژمارە بەهێزە تارو مار بکات‌و لە ناویان ببات‌و بزانرێت کێ راستەو کێ ناراست تا ئەوەی کە لەناو دەچێت لەسەر چاورۆشنی بێ‌و بەهانەی نەبێ لە رۆژی دواییداو نەڵێت نەم زانی محمدﷺ و پەیڕەوانی راستن ، بۆیە دوژمنایەتیم دەکردن بەڵام بەجەنگی "بەدر" دەرکەوت کێ راستەو ﷲ ی لە گەڵدایەو کێیش ناراستەو دژی ﷲ یە ئیتر لەناو چونی کافران لە سەر چاورۆشنیەو تا ئەوەیشیان کە دەژیءو باوەڕی بەئایین هەیە بە چاورۆشنی بژێت‌و بزانێ کە رێبازەکەی راستەو پەروەردگاری لەگەڵدایەو یارمەتی دەدات‌و لەزۆری هێزی دوژمنانی ئایین نەترسێت، وەبەبێگومان ﷲ بیسەری هەمو قسەکانتانەو زانەری هەمو ئیشەکانتانەو هیچی لێ پەنا نادرێت.

جا هەربۆ ئەوەی هەردوولا سوربن لەسەر جەنگ ﷲ دەفەرموێ:

﴿٤٣﴾ بیر بکەرەوە لەو کاتەی کەﷲ بێ باوەڕانی لە خەودا بەکەمی خستەبەر چاوی ئێوەو ترستان نەما لێیان‌و دڵی بەهێزکردن ، ئەڵێن پێغەمبەرمانﷺخەوی دیءو لە خەویدا بێ باوەڕانی زۆربەکەمی هاتە پێش چاوو ئەمەیشی باسکرد بۆ موسڵمانان‌و زۆر دڵیان خۆشبو، بۆ؟ چونکە ﷲدەفەرموێ: ئەگەر من ئەوانم بەزۆری پیشانی تۆبدایە ئێوە دەترسان‌و شکستان دەخواردو بەدڵنیاییەوە ناکۆکی لەناوتاندا پەیدا دەبو سەبارەت بەوەستان‌و جەنگ کردن وشپرزە دەبون بەڵام ﷲ ئەم بڕیارەی داوەو دەبێت جەنگ بکرێت ئەم خەوەی بە پێغەمبەرﷺ پیشان داو ئەویش بە موسڵمانانی فەرمو: بە بێگومان کەئەو زانایە بەوەی کەلەناو دڵەکاندا هەیەو دەزانێ چۆن بەهێزیان بکات‌و چۆن لاوازیان بکات ئەوەتە دیسان دەفەرموێ:

﴿٤٤﴾ دەی بیر بکەرەوە لەو کاتەی کەﷲ ئەوانی بەشێوەیەکی کەم خستە پێش چاوی ئێوە کاتێ کە گەیشتنە یەك بۆ شەڕ وەهەروەها ئێوەیشی کەم کردەوە لە بەر چاوی کافران‌و زۆر بەکەمیان زانین‌و بێ ترسبون لێتان‌و پەلاماریان هێنا بەڵام کاتێ دەستکرا بەشەڕو هەردوولا رژانە ناو یەك ﷲ باوەڕدارانی زۆرکرد لەبەرچاوی دوژمنان‌و ترسی زۆریان لێ نیشت‌و گەرم‌و گوڕی پەلامارەکانیان نەماو هەرکەس دەیویست خۆی رزگار بکات بەم شێوەیە ئەم ئایەتە لە گەڵ ئایەتی سیانزەی سورەتی "ال عمران" دا ناگیرێنەیەك بۆهەریەکێکیان جێگای تایبەتی خۆی هەیە، بەڵێ ﷲ کافرانی بەشێوەیەکی زۆرکەم خستەبەر چاوی موسڵمانان‌و موسڵمانانیشی هەروا بەشێوەیەکی کەم خستە بەر چاوی کافران، بۆچی؟ بۆئەوەی کەﷲ جێ بەجێی بکات ئیشێك کە لەلای خۆی ئەنجام دراوە، وەتەواوی کارو بارەکان دەگەڕێنەوە بۆلای ئەوو ئەوەی کە بڕیاری داوە هەرئەوە دەبێ‌و کەس ناتوانێ بیگۆڕێت، جا ئەو بڕیاری دابو کەلەم جێگاداو لەم کات‌و سەردەمەدا ئەو جەنگە ببێ‌و راست‌و ناراست بۆهەمو کەس دەرکەوێت‌و ببێت بەخاڵێکی گرنگ لە گۆڕانی کاری ئیسلامیءو جیابونەوەی دەوری خۆگریءو دان بەخۆداگرتن لەگەڵ دەوری خۆ ئامادەکردن‌و هێرش‌و جەنگ‌و پەل هاویشتن بەم لاولای وڵاتە تازە پێگەیشتوەکەی ئیسلامداو قۆناغی خۆ مت کردن‌و بێ دەنگی گۆڕی بۆ قۆناغی دامەزراندنی سوپایەکی ئازاو لێ هاتوو گیان فیدا، بەراستی هەر لێکدانەوەی قورئان جوانە کەئەو دوو قۆناغە لەیەك جیا دەکاتەوەو دەفەرموێ ﴿ يَوۡمَ ٱلۡفُرۡقَانِ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ ﴾ الأنفال: ٤١

بەڵێ دەورەی دان بەخۆدا گرتن نەماو کاسەی خۆگری موسڵمانان پڕبو ئینجا نۆرەی رژاندنێتیءو بەم جەنگە ﷲ چرای سەوزی بۆ موسڵمانان رۆشن کردو دڵی بت پەرستانی هێنایە بەردەستیان‌و هەمو برینەکانی سارێژکردن‌و تێی گەیاندن کە ئەودۆستانی خۆی خۆشدەوێت هەرلەبەر ئەو خۆشەویستیەشە دوچاری هەندێ کۆسپ‌و تەگەرەیان دەکات تا ترسنۆك‌و ناپاك لە ریزەکانیان دەرپەڕێنێ‌و پاك‌و خاوێنەکان بمێننەوەو جاوا لێرەدا وانەیەکی تری گرنگی کاتی جەنگ بەخاوەن باوەڕان دەڵێت وتێیان دەگەیەنێ کە جەنگی ئێوە تەنها چەك‌و چۆڵەنیەو فێربونی ئیشی سەربازی نیە بەڵکو سەرەڕای ئەوەش دووشتی تری گرنگ هەن ئەبێ ئاگاتان لێیان بێت جا بۆ رۆشن کردنەوەی ئەو دووشتە دەفەرموێ:

﴿٤٥﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە گەیشتن بە کۆمەڵێکی بێ باوەڕ لە کاتی شەڕدا سابت‌و خۆگربن‌و رانەکەن

وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَا تَنَٰزَعُواْ فَتَفۡشَلُواْ وَتَذۡهَبَ رِيحُكُمۡۖ وَٱصۡبِرُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٤٦﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ خَرَجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بَطَرٗا وَرِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ وَٱللَّهُ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٤٧﴾ وَإِذۡ زَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَقَالَ لَا غَالِبَ لَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَإِنِّي جَارٞ لَّكُمۡۖ فَلَمَّا تَرَآءَتِ ٱلۡفِئَتَانِ نَكَصَ عَلَىٰ عَقِبَيۡهِ وَقَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكُمۡ إِنِّيٓ أَرَىٰ مَا لَا تَرَوۡنَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَۚ وَٱللَّهُ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٤٨﴾ إِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ غَرَّ هَٰٓؤُلَآءِ دِينُهُمۡۗ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٤٩﴾ وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذۡ يَتَوَفَّى ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٥٠﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٥١﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٥٢﴾

کەئەمە مەرجێکی گرنگی پیرۆزییە، **دووهەمیش**: زۆریادیﷲ بکەنو لەو کاتەدا ﷲ تان لە بیر نەچێت بەڵکو سەرکەونو لەدەستی دوژمنان رزگارببن. ئەمەیە وانەی قوتابخانەی قوتابیانی قورئانوﷲ خۆی مامۆستایی سەربازەکانی خۆی دەکاتو فێری خۆگریو هۆی سەرکەوتنیان دەکات جا خۆزگە بەو کەسەی کە بەراستی قوتابی ئەو قوتابخانە دەبێت ، لێرەش ئەوەمان تێ دەگەیەنێ کە خاوەن باوەڕان کاتێ کە خەریکی بەندایەتێکی گرنگی وەك جیهاد دەبن نابێ بێجگە لە ﷲ مەبەستێکی تریان هەبێت چونکە هەرکەسێك مەبەستێکی غەیری ﷲ ی هەبێ با لە جیهادیش دا بکوژرێت هیچ سودی نابێو دۆزەخ جێگایەتیو پێویستە خاوەن باوەڕان نیەتی خۆیان پاك بکەنەوە لە هەمو خەوشو خاڵێك ، راست لەبەر ﷲ جەنگ بکەنو مەبەستێکی تریان نەبێ بۆیە دووبارە دەفەرموێ:

﴿٤٦﴾ دەی پەیڕەویﷲ و پێغەمبەرەکەیﷺ بکەنو سەربازێکی راستەقینەی ﷲ و پەیڕەوی پێغەمبەرﷺ بنو ناکۆکی لەنێوان خۆتاندا دروست نەکەن، بۆ؟ چونکە ئەگەر ناکۆکیتان دروست کرد ئەوسا شکست دەخۆنو ئیتر ناووناوبانگی خۆتان لەدەست دەدەن چونکە ئەگەر موسڵمانان بەراستی پەیڕەویی ﷲ و پێغەمبەرﷺ بکەنو ناکۆکی لە نێوان خۆیاندا دروست نەکەن خاوەنی ناوو ناوبانگو هێزو دەسەڵات دەبن بەڵام هەرمەرجێك لەو سێ مەرجانەیان تێدا نەما ناوو ناوبانگ لەدەست دەدەنو دوژمن تارو ماریان دەکات جا ئەگەر شتێك هەبێ کە هۆی ناکۆکی بێ بابەزوی بن بڕی بکەنو نەیەڵن تەشەنەبکات، وەئەگەر هەرنەکرا دان بەخۆتاندا بگرن چونکە بێگومان کەﷲ لەگەڵ خۆگراندایە ئەوکەسەی کە خۆی دەگرێت ﷲ یارمەتی دەداتو کارو کۆششی زایەناکات، جا کەسێك خۆی بگرێو ﷲ ی لەگەڵ دابێ چاکەو سەرکەوتوە یان کەسێك ناکۆکیو دوودەستەی دروست بکات کە هۆی رقو قینی ﷲ یەو سەر ئەنجامیشی روخانو نەمانێتی؟ واتە لەم دوو ئایەتەدا پێنج مەرجی سەرکەوتنی پێ فەرموین بەخۆگری ویادی ﷲ لە جەنگا ، پەیڕەوی ﷲ وپەیڕەوی پێغەمبەرﷺ، دوورکەوتنەوە لە ناکۆکیو دووبەرەکی. جائەوانەی کە ئەیانەوێ خەلافەتی ئیسلام بگەڕێننەوە باتەماشای خۆیان بکەنو بزانن ئەم پێنج خاڵە لەواندا هەیە یان نە؟ ئاشکرایە ئەگەر نەڵێین هیچ خاڵێکیان تێدا نیە زۆربەی ئەو خاڵانە لەوان دا بەپێچەوانەیە، جا ئەگەر نەگەڕێنەوە بۆ راستە رێگا بەراستی گومڕابوونو گومڕاکەرن، ئینجا ﷲ ی باڵادەستو زانا وانەیەکی تر بە قوتبیانی قوتابخانەکەی خۆی دەڵێتو دەفەرموێ:

﴿٤٧﴾ ئێوە وەکو ئەوکەسانە نەبن کەدەرچون لە ماڵەکانیان لوت بەرزو خۆبەزل زانو خۆبەخەڵك پیشاندەرانەو بەربەستیان لە رێگای ئایینی ﷲ دا دادەناو خەڵکیان بەرگری دەکرد لە ئایین، بێگومان کە ﷲ دەزانێ بەو ئیشانەی کە ئەوان دەیکەنو هیچی لە زانینی ﷲ دەرناچێت چونکەﷲ بەزانیاری خۆی گەمارۆی ئیشەکانیانی داوە ، جا چی دەکەنو بۆکوێ دەچن خۆ ئەوان چواردەوریان گیراوە ، ئەمە وەسفی ئەو بت پەرستانەی مەکە بو کاتێ کەهاتن بۆ بەدر ، جائێوەی باوەڕدار نابێ ئەو وەسفانەتان تێداهەبێت ، بەراستی ئەڵێیت ئەم قورئانە ئەمڕۆ دابەزیوە کابرا خۆی بەموسڵمان دەزانێ کەچی لوت بەرزەو هەمیشە خەریکی رێگرتنی بڵاوبونەوەی ئایینی ﷲ یەو لەرێگای پەیڕەوانیدا دەیان کۆسپ سازدەدات ، تەنانەت لە کوشتنی باوەڕدارانیش کۆتایی ناکات، با فەرمانڕەوایانی وڵاتانی ئەمڕۆی ئیسلامی تەماشای خۆیان بکەنو لەگەڵ ئەم ئایەتەدا بەراوردێکی خۆیان بکەن کەئەم ئایەتە بۆ تۆی موسڵمانە ئەگەر ئەوسییفەتەت تێدا نیە سوپاسی ﷲ بکە ، وەئەگەر هەیە بەزەییت بەخۆتا بێتەوەو تاروبەروی دادگای ﷲ نەبویتەوە پەشیمان بەرەوەئەرکی گەیاندنی ئەو پەیامە بەرێزە بەواجبی خۆت بزانە تاوەك دنیات هەیە قیامەتیشت هەبێت دڵنیابە کە سبەینێ بەروتوقوتیوبێ دەسەڵات لەبەردەم دادگای ﷲ دا رادەگیرێیتو بەوردی حیسابت لەگەڵدا دەکرێت ، ئینجا ﷲ وێنەیەکی تری ئەو روداوە دەخاتە بەرچاومانو دەفەرموێ:

(٤٨) جا بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە شەیتان کردارە ناپەسەندەکانیانی بۆ جوان کردنو وتی: ئەمڕۆ هیچ کەسێك بەسەر ئێوەدا سەرناکەوێت ، دەڵێن: شەیتان لەشێوەی(مالیکی کوڕی مودلەجیدا)کە یەکێ بو لە پیاوە ناودارەکانی کەنانە هاتە ریزی بت پەرستانی مەکەو وتی: من پەنای ئێوە دەدەمو نایەڵم کەسێك لێرەدا شتێك بکات کە ئێوە پێتان ناخۆش بێت بەڵام کاتێك کەهەردوو کۆمەڵ بەرامبەری یەکتر وەستان ئینجا ئەو تاوانبارە پاشەکشەی کردو وتی: من بێوەریم لە ئێوە، چونکە بەبێگومان من شتێك دەبینمو دەزانم کەئێوە نایبیننو نایزانن، دەڵێن: چاوی بەجبرەئیل وئەو فریشتانە کەوت کە دابەزی بون بۆ یارمەتی دانی موسڵمانان جا ئەوزۆر ترساو پاشەکشەی کردو گەڕایەوەو وتی: بەبێشك من لە ﷲ دەترسمو بەراستی ﷲ تۆڵەی زۆر سەختە ، جا کاتێ کەروبەڕوبونەوە موسڵمانان بەوکەمیەی خۆیانو ﷲ یش کەمتری کردبونەوە لەبەر چاوی دوژمنان ، ئەوانەی کەلە مەکەدا باوەڕیان هێناو بەڵام کۆچیان نەکردبو ئێستایش هاتبون بۆ بەدرو چاویان بە موسڵمانان کەوت دەستیان کرد بەقسەی ناشیرین وەك ﷲ دەفەرموێ:

(٤٩) بیربکەرەوە ئەی محمدﷺ لەوکاتەی کە موناففقانو دڵ نەخۆشان دەیان وت: بەراستی ئەوانە ئایینەکەیان سەری لێ تێکداونو مەغروری کردوون ئەگینا چۆن بەوکۆمەڵەکەمەوە ئامادەی شەڕکردن دەبن لەگەڵ ئەم کۆمەڵە زۆرو پڕ چەکو بەهێزەدا؟ بەڵێ لای دنیا پەرستان تەنها شتی رواڵەتی دەوری هەیەو باوەڕیان بەشتە نهێنیەکان نیەو هەمیشە هەر بە"ربە"ی خۆیان دەپێون، جا ﷲ پوچیو بێ ناوەرۆکی بۆچونەکانیان بەم شێوە رون دەکاتەوەو دەفەرموێ: ئەوسا هەرکەسێك پشت ببستێ بە ﷲ، بەسە بۆی چونکە بەبێگومان کە ﷲ دەسەڵاتدارو کاربەجێیە. جا ئەو کەسەی پشتی بەو بەست کێ دەتوانێ پشتی لە زەوی بدات؟ ﷲ هەرخۆی دەتوانێ لە ناویان ببات بەڵام نایکات چونکە دنیایی بۆ تاقی کردنەوەی مرۆڤ دروستکردوە ، ئینجا ﷲ باسی سەرەمەرگی بێ باوەڕان دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٠) ئەی محمدﷺ ئەگەر چاوت لێ بوایە ئەو کاتەی کە فریشتەکان گیانی ئەوکەسانەیان دەکێشا کە بێ باوەڕبوون چ وەزعێکی خراپیان بو کە فریشتەکان بۆ تۆڵە سەندنەوەی ئایینی ﷲ لەبت پەرستان، پێش گیان دەرچوونیان لەدەمو چاویانو لەپشتیان دەدانوپێیان دەوتن: دەی بچەژن سزای سوتێنەر. بەڵێ بێ باوەڕان هەر لە نزیکەی سەرەمەرگییەوە سزاو هەڕەشەو قسەی ناشیرین پێ وتنیان دەست پێ دەکات جا ئەوە نەبێ کە ﷲ ستەمیان لێ بکات، نەخێر بەڵکو بەهۆی ستەمکاری خۆیانەوە دوچاری ئەو رۆژگارە سەختەدەبن وەك دەفەرموێ:

(٥١) ئەوەش بەهۆی ئەو کردارە خراپانەیانەوە بو کەپێش هاتنی مەرگ کردبویانو بەبێشك کە ﷲ هیچ ستەمێك لە بەندەکانی خۆی ناکات. وشەی (ظَلَّام) صیغەی مبالەغە نیە بەڵکو ناوێکی نیسبیە واتە ستەم نادرێتە پاڵ ﷲو ستەمکار نیە وەکو (بَقال، خَباز /میوە فرۆش، نانفرۆش) نەك بڵێیت ﷲ زۆر ستەم ناکات، لە فەرمودەی قودسیدا هاتوەو ئیمامی موسلیم لە پێغەمبەرەوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کەﷲ فەرمویەتی:{ يَا عِبَادِي إني حَرَمْتُ الظلْمَ عَلَى نَفْسِي وَجَعَلْتُهُ بَيْنَكُمْ مُحَرَمًا فَلا تَظالَمُوا / ئەی بەندەکانم من ستەمم لە خۆم قەدەغەکردووە لە نێوان ئێوەشدا قەدەغەم کردوە سا ئێوەش ستەم لە یەکتر نەکەن} بەڵێ ﷲ ستەم ناکات بەڵام بەندە ستەم لە خۆیو خەڵکیش دەکاتو سەرئەنجام بەو رۆژە رەشو ناهەموارە دوچار دەبێت ، ئەوەبو بێ باوەڕانی مەکە بەسەرپەرشتی فیرعەونی ئەم گەلە هەرچییان توانی لەدژایەتی پێغەمبەروﷺ پەیڕەوانیو رێبازی ﷲ کردیان بۆ ئەوەی کۆتایی بەژیانی پێغەمبەرﷺ و پەیڕەوانی بهێننو هاتنە "بەدر" بەڵام ئابەو شێوەیە ﷲ تۆڵەی ئەوەڵو ئاخری لێ کردنەوە، وەئەم تۆڵە کردنەوەی ﷲ لە تاوان بارانو بێ باوەڕان رەووشتێکی ﷲیەو ناگۆڕێ وەك دەفەرموێ:

(٥٢) ئەمەی کەبەم کافرانەی بەدر کرا هەروەکو ئەوە وایە کەبە دارو دەستەی فیرعەونو ئەوانەی پێش ئەویش کرا چونکە ئەوانیش بێ باوەڕبوون بە نیشانەکانی ﷲ جا ﷲ بەهۆی گوناهەکانیانەوە تۆڵەی لێ سەندن بەبێگومان کە ﷲ تۆڵەی بەهێزەو زۆر سەختە.

(٥٣) بڕیاری ﷲ ئائەوەیە چونکە بەبێشك ﷲ هەر نیعمەتێکی دابێت بەگەلێك نەیگۆڕیوە هەتا ئەو گەلە خۆیان هەوڵی گۆڕاندنیان نەدابێتو ئەو بارو دۆخەچاکەی خۆیان نەگۆڕیبێت ئاشکرایە نیعمەتی ئایینو پێغەمبەرایەتی لە هەمو نیعمەتەکانی تر گەورەترە جا هەرکاتێك ﷲ پێغەمبەرو ئایینێکی ناردبێ بۆ گەلێك ، ﷲ تۆڵەی لێ وەرنەگرتون تا خۆیان پشتیان کردوەتە ئایینو پێغەمبەرەکەیانو دژی وەستاوون ئینجا ﷲ تۆڵەی لێ سەندونو سزای داوون ئەوەبو ﷲ بەم گەلەیشی فەرمو تا پێغەمبەرتان لەناودابێ یان تا پەشیمان ببنەوەو داوای لێ خۆشبون بکەن ﷲ سزاتان نادات، بەڵام ئەوان هەم پێغەمبەریانﷺ دەرکردو هەم پەشیمانیش نەبوونەوە بەڵکو

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ لَمۡ يَكُ مُغَيِّرٗا نِّعۡمَةً أَنۡعَمَهَا عَلَىٰ قَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٥٣﴾ كَدَأۡبِ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ فَأَهۡلَكۡنَٰهُم بِذُنُوبِهِمۡ وَأَغۡرَقۡنَآ ءَالَ فِرۡعَوۡنَۚ وَكُلّٞ كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ إِنَّ شَرَّ ٱلدَّوَآبِّ عِندَ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٥﴾ ٱلَّذِينَ عَٰهَدتَّ مِنۡهُمۡ ثُمَّ يَنقُضُونَ عَهۡدَهُمۡ فِي كُلِّ مَرَّةٖ وَهُمۡ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾ فَإِمَّا تَثۡقَفَنَّهُمۡ فِي ٱلۡحَرۡبِ فَشَرِّدۡ بِهِم مَّنۡ خَلۡفَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِمَّا تَخَافَنَّ مِن قَوۡمٍ خِيَانَةٗ فَٱنۢبِذۡ إِلَيۡهِمۡ عَلَىٰ سَوَآءٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٨﴾ وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَبَقُوٓاْۚ إِنَّهُمۡ لَا يُعۡجِزُونَ ﴿٥٩﴾ وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ وَءَاخَرِينَ مِن دُونِهِمۡ لَا تَعۡلَمُونَهُمُ ٱللَّهُ يَعۡلَمُهُمۡۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيۡءٖ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يُوَفَّ إِلَيۡكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تُظۡلَمُونَ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلۡمِ فَٱجۡنَحۡ لَهَا وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦١﴾

هاتن لەبەدرا کۆتایی بەتەمەنی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ و یارەکانی‌و ئایینەکەی بهێنن ئەوەبو ﷲ چی بەسەر هێنان ، وە ئەمەش رەوشتێکی هەمیشەی ﷲ یە لە پێش ئەوان‌و لە پاش ئەوانیشداو بێگومان کە ﷲ بیسەری هەمو جۆرە قسەیەکە ئاشکرابێ یان پەنامەکی‌و زانەری هەمو ئیش‌و کارو بارێکە چۆن بێ‌و کەی بێ‌و لە کوێدابێت ، چاك‌و خراپی لێ ناگۆڕێت‌و ستەم لە هیچ کامیان ناکات ، داروودەستەی فیرعەون دژایەتی موساو بەڵگە رۆشنەکانی ﷲ یان کرد وەك دەفەرموێ:

(٥٤) وەکو خووڕەوشتی ئالی فیرعەون‌و ئەوکەسانەی کەلە پێش ئەوانەوەبون کەئەمانە هەمویان بێ باوەڕبون بە نیشانەکانی پەروەردگاری خۆیان ئەوسا ئێمەش بەهۆی گوناهەکانیانەوە ئەوانمان لەناو بردو دەستەو دایەرەی فیرعەون _بەخۆیەوە_ لەدەریادا نوقممان کردن‌و هەمویان ستەمکاربون بۆیە ئاوامان لەگەڵدا کردن. خۆ مرۆڤ زۆربەنرخە لەلای ﷲ ئەگەر باوەڕداربێ بەڵام ئەگەر لە یاسای ﷲ لای داو دژایەتی ئایینی کرد ئینجا دەفەرموێ:

(٥٥) بێگومان خراپترین شتێك کە بەسەر ئەم زەویەدا هاتو چۆبکات لەلای ﷲ ئەوکەسانەن کە کافرن ئیترئەوانە باوەڕناهێنن. جا ئەوانەمان بۆ پێناسە دەکات‌و دەفەرموێ:

(٥٦) ئەوانەن کەتۆ پەیمانیان لەگەڵدا دەبەستی بەڵام ئەوان هەمو جارێك ئەو پەیمانە دەشکێنن‌و گوێی پێ نادەن‌و ئەوان هەرگیز لە خراپەو تاوان‌و خیانەت‌و پەیمان شکاندن خۆیان ناپارێزن ، بۆیە ﷲ تورەیە لێیان‌و دەفەرموێ:

(٥٧) جا هەرکاتێ تۆ توشی ئەوان بوی لەشەڕدا دەستی وایان لێ بوە شێنە کە کەسانی تر بیر لە خیانەت‌و پەیمان شکاندن نەکەنەوە ، بەڵکو بیر بکەنەوەو کارێکی ئاوانەکەن کە دوچاری ئەو سزاو تۆڵەی دنیا ببن بەدەستی موسڵمانان وەکو ئەوەی لە بەدردا بەسەر بت پەرستانی مەکەدا هات ، واتە جەنگی ئیسلام بۆ لە ناو بردن‌و بن بڕکردنی جەنگە، جەنگە لە پێناوی نەمانی جەنگدا دەبێ تاوان بارانی شەڕخواز وایان لێ بدرێت کە هەرکەسێکی بێ باوەڕو دەرون پیس بیستی جورئەتی دژایەتی ئایین نەکات ، ئاشکرایە کە جورئەتی جەنگی نەکرد ، جەنگیش نابێ‌و خۆیشیان‌و باوەڕدارانیش دەحەسێنەوە ، جا پاش ئەوەی کە ﷲ سەربازەکانی خۆی هەڵناو داوای لێ کردن کەلە جەنگدا خۆگرو چاو نەترس‌و گورزوەشێن بن، باسی ترسان لەوانەی کە پەیمانیان بەستوە بەڵام بەهەڵس‌و کەوتەکانیاندا دەردەکەوێت کە پابەند نین بە پەیمانەکانیانەوەو لەوە دەچێت کە ئەگەر هەلیان بۆ بڕەخسێت هێرش بکەنە سەر موسڵمانان ، سەبارەت بەمانە دەفەرموێ:

(٥٨) جا ئەگەر تۆ ترسای لە هەر گەلێك کە خیانەت بکەن لە گەڵتا دەی تۆش پەیمانەکانیان پێ بدەرەوە تا ئێوەو ئەوان وەك یەکبن‌و هیچکامتان پابەند نەمێنن بەو پەیمانەی کە لەپێشەوە بەستوتانە واتە دەبێ ئاگاداریان بکەیت‌و نابێ پێش ئاگادارکردنیان هێرش بکەیتە سەریان چونکە ئەوە خیانەتەو بەبێگومانﷲ خیانەتکارانی خۆش ناوێت هەرکەسێك ببێت ، واتە نابێت بۆ ئەوەی بگەیت بە سودێکی ئایین ڕێگای خیانەتکاری‌و درۆو دەلەسە بگریتەبەر ، لە روانگەی ئیسلامەوە مەبەستی چاك هۆکانی چاك ناکات‌و نابێ بۆ هەدەفێ بەنرخ‌و بەرز ڕێگای خیانەتکاری بگرێتەبەر ، خیانەت خیانەتە درۆ درۆیەو خراپە خراپەیە هەرکەس بیکات بۆهەرچی بیکات ، دیسان هەربۆ بەهێزکردنی سەربازانی راستەقینەی ئیسلام ﷲ ی باڵادەست هێزو توانایی بێ باوەڕان بێ نرخ دەکات‌و دەفەرموێ:

(٥٩) باکافران وانەزانن کەوا پێش کەوتوون لە دەسەڵات‌و هێزیانداو لە چەك‌و چۆڵەو زۆری ژمارەیاندا ئیتر دەتوانن هەمو

ئاواتی خۆیان بێننەدی‌و چیان دەوێ بیکەن ، یان ئەی محمدﷺ تۆ ئەو گومانە نەبەیت بە بێ باوەڕان لەبەر پێشکەوتن لە هێزو دەسڵاتیاندا، چونکە ئەوان ناتوانن ﷲ دەستە پاچەبکەن، ئەوان ناتوانن لە دەستی هێزیﷲ دەربچن هەر چۆن ببن لە چاو هیزو دەسڵاتیﷲ دا ناگات بە هیزی بچوکترین گیان لەبەری زەوی.

ئینجا دەفەرموێ:

(٦٠) ئەوسا ئێوە خۆتانیان بۆ ئامادە بکەن بەئەوەی کەلە تواناتاندایە بۆ بەر پەرچدانەوەیان‌و نەترسن چونکە ئێوە هێزی بێ سنوری ﷲ تان لەگەڵدایە ، لێرەدا نەیفەرموە خۆتان ئامادەبکەن بە هێزو چەك‌و چۆڵە وەك دوژمن بەڵکو دەفەرموێ: ئێوە بەگوێرەی توانای خۆتان خۆتانیان بۆئامادەبکەن‌و ئەوەی کەلە تواناتاندا نیە وازی لێ بهێنن بۆ تواناوو هێزی ﷲ ، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە لەسەر ئەوەی کە ﷲ سەربازانی راستەقینەی خۆی خۆش دەوێت‌و هەمیشە دێت بەهاواریانەوەو هەر لەسەرەتاوە رێنماییان دەکات‌و ورەیان بەرزدەکاتەوەو لە پاشانیشدا لەمەیدانی شەڕدا هێزی خۆی دەخاتە کارەوە بۆیان‌و بەدەستی باوەڕداران تۆڵە لە دوژمنان وەردەگرێت‌و سەرئەنجامی هەمو جەنگەکان بەقازانجی باوەڕداران دەبێ ، بەمەش دوژمنانی ئایین دەترسێنێ‌و دەفەرموێ: خۆتان ئامادە بکەن بۆیان بەوەی کەلە تواناتاندا هەیە لە هێزو لە ئامادەکردن‌و بەستنەوەی ئەسپەکان ـ لەوسەردەمەدا ئەسپ وەکو دەبابەی ئەمڕۆوابوە ـ تا دوژمنانیﷲ و خۆتانی پێ بترسێنن ، مەبەست لە هێز لەم ئایەتەدا فێربوونی تیرئەندازی‌و شارەزابوونە لە چەك‌و چۆڵەی سەردەم بەگوێرەی توانا هەروەك ئیمامی ئەحمەدو ئیمامی موسلیم لە پێغەمبەرەوەﷺ بۆمان دەگێڕنەوە کە فەرمویەتی: {ألا إن القُوةَ الرمْيُ ألا إن القُوةَ الرمْيُ ألا إن القُوةَ الرمْيُ/ ئاگاداربن قوەت تیرەندازییە، ئاگاداربن قوەت تیرەندازییە ، ئاگاداربن قوەت تیرەندازییە}

تا بترسێنن دوژمنە دیارییە کانتان تا بترسن بەوهێزەی ئێوە بێجگە لەوانەی کەخۆتان دەیانناسن کەسانێکی تر کەئێوە پێیان نازانن‌و لە دڵدا رق‌و قینیان لێتانە بەڵام دەریان نەخستوەو بۆ فرسەت دەگەڕێن جا بەو هێزەی ئێوە ئەوانیش دەترسن‌و ئەو نیەتە پیسەی خۆیان دەرناخەن‌و جورئەتی جموجوڵ ناکەن ، لەراستی دا مەبەستی ئایین نەهێشتنی ترس‌و شەڕو شۆڕە جا بەم خۆئامادە کردنەی باوەڕداران دوژمنی دیاری‌و دوژمنی نادیاری کە

وَإِن يُرِيدُوٓاْ أَن يَخۡدَعُوكَ فَإِنَّ حَسۡبَكَ ٱللَّهُۚ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَيَّدَكَ بِنَصۡرِهِۦ وَبِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ وَأَلَّفَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡۚ لَوۡ أَنفَقۡتَ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مَّآ أَلَّفۡتَ بَيۡنَ قُلُوبِهِمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ أَلَّفَ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّهُۥ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَسۡبُكَ ٱللَّهُ وَمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٦٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ حَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ عَلَى ٱلۡقِتَالِۚ إِن يَكُن مِّنكُمۡ عِشۡرُونَ صَٰبِرُونَ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿٦٥﴾ ٱلۡـَٰٔنَ خَفَّفَ ٱللَّهُ عَنكُمۡ وَعَلِمَ أَنَّ فِيكُمۡ ضَعۡفٗاۚ فَإِن يَكُن مِّنكُم مِّاْئَةٞ صَابِرَةٞ يَغۡلِبُواْ مِاْئَتَيۡنِۚ وَإِن يَكُن مِّنكُمۡ أَلۡفٞ يَغۡلِبُوٓاْ أَلۡفَيۡنِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ حَتَّىٰ يُثۡخِنَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ تُرِيدُونَ عَرَضَ ٱلدُّنۡيَا وَٱللَّهُ يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٦٧﴾ لَّوۡلَا كِتَٰبٞ مِّنَ ٱللَّهِ سَبَقَ لَمَسَّكُمۡ فِيمَآ أَخَذۡتُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٦٨﴾ فَكُلُواْ مِمَّا غَنِمۡتُمۡ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٩﴾

تەنها ﷲ بەوان دەزانێت ، هەرەکۆیان لێ دەکەوێت‌و ناتوانن دەستدرێژی بکەنە سەر موسڵمانان‌و وڵاتی ئیسلامی‌و هەردوولا بە ئەمن‌و ئاسایش دەژین، لەراستیدا نەمانی ئەوقوەت وهێزەیە بۆیە دەبینین دوژمنان ئەمڕۆگەلەکۆمەیان لێ کردوین‌و لەهەمو لایەکەوە هێرشیان کردوەتەسەرمان‌و دەمیان ناوەتە ناو خوێن‌و سەروەت‌و سامانمان‌و نابێ قسەیش بکەین؟!

ئینجا چونکە خۆ ئامادەکردن‌و پەیدا کردنی هێزو دەسەڵات نیازی بەسەروەت‌و سامان هەیە دوابەدوای داواکردنی خۆئامادەکردن بەخاوەن باوەڕان دەفەرموێ: ئەوسا ئەوەی کە ئێوە دەیبەخشن لەرێگای ﷲ دا بۆ بەهێزکردنی ئایین‌و سەقامگیرکردنی‌و هیچ مەبەستێکی تری تێکەڵاو نییە دڵنیابن کەپاداشتتان پێ دەدرێتەوەو ئێوە ستەمتان لێ ناکرێت بەڵکو پاداشتان بەزیادەیەکی لە سنوربەدەر پێ دەدرێتەوە وەك لە سورەتی ( بەقەرە) دا باسمان کرد . جا هەروەك وتمان جەنگ بۆ نەهێشتنی ئاشوب‌و ترس‌و جەنگە ئەوەتە هەرکاتێ دوژمنانی ئایین ئامادەی ئاشتەوایی ببن ، داوا لە باوەڕداران دەکات کە ئێوەش باڵی بەزەیی‌و ئاشتی‌و دڵسۆزی راکێشن ، وەك دەفەرموێ:

(٦١) خۆ ئەگەر لەکاتی شەڕدا ئەوان تەسلیم بوون‌و ملیان دا بە ئاشتی ، تۆش ئەی پێغەمبەرﷺ ئەو ئاشتیە وەرگرەو شەڕ

مەکەو مەترسە لە فڕو فێڵی بێ باوەڕان بەڵکو ئاشتەوایی بکەو پشت ببەستە بە ﷲ، ﷲ خۆی بەسە کە چاو دێرو پارێزەرو یارمەتی دەرت بێ، خۆ بێگومان ئەوخۆی بیسەرە بۆ هەر بڕیارێکی ئەوان‌و زانەرە بۆ هەرکردارێکیان کەواتە ئێوە خەم مەخۆن ﷲ وەعدەی داوە کە یارمەتی دەری موسڵمانان بێ. وشەی(جَنَحُ )واتە مەیل کردن،

(٦٢) ئەوسا ئەگەر ئەوان ویستیان بەو شەڕ وەستانە خیانەتت لەگەڵدا بکەن ، تۆ پشتت ببەستە بە ﷲ و مەترسە ، ئەوسا بەبێشك ﷲ بەسە بۆتۆ هەر ئەو تۆ بەهێز دەکات بەیارمەتی خۆی‌و بەباوەڕداران‌و هەر ئەو لە توانایدایە کە هەرچی ئارەزۆبکات بیکات‌و کەس ناتوانێ ڕێگا لەکاروباری بگرێت،

(٦٣) خوا پەیوەندی‌و ئولفەتی دروستکردوە لە نێوان دڵی موسڵمانان داو بەراستی ئەگەر ئەوەی کەلە سەر زەویدا هەیە هەموی پارەوسامانی تۆ بوایە ئەی محمدﷺ و هەموت خەرج بکردایە بۆئەوەی کە دڵەکانیان بکەیت بەیەك نەت دەتوانی بەڵام ﷲ دڵە کانی لکاندن بەیەکەوەو برایەتی‌و دۆستایەتی‌و خۆشەویستی خستەناویانەوە بەبێگومان کە ئەوزاتە بەهێزو دەسەڵات دارو کاربە جێیەو لە جێگای خۆیدا ئیشی خۆی دەکات .

بەڵێ ئابەو شێوەیە ﷲ ئەو نیعمەتە زۆرو فرەوانەی خۆی بۆ پێغەمبەرمانﷺ باس دەکات‌و دەیخاتەوە بیری تا باشتر سوپاسی ﷲ بکەن‌و چاکتر فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەن‌و دڵنیا تربن لەسەر ئەوەی کەﷲ یان لەگەڵدایەو هەرخۆیەتی کە ئەو دڵانەی کە زیاتر لە سەد ساڵ ناکۆکی نێوانیان، وای لکاندن بەیەکەوە کەگیانی خۆیان لەسەر یەکتر فیدا بکەن؟! ئینجا ﷲ ی باڵادەست‌و میهرەبان ڕودەکاتە پێغەمبەرمانﷺ و دەفەرموێ:

(٦٤) ئەی پێغەمبەرﷲ ﷺ بەسە بۆتۆو بۆ ئەو کەسەی کە پەیڕەوی تۆیە لە باوەڕداران‌و پێویستیتان بەکەسی ترنیەو ترستان نەبێ لە زۆری چەك‌و چۆڵەی دوژمن . جارێکی تر ﷲ بەوەسفی پێغەمبەرایەتی بانگی پێغەمبەرمانﷺ دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٦٥) ئەی پێغەمبەرﷺ باوەڕداران هەڵنێ لەسەر غەزاو ترسیان بشکێنە چونکە ئەگەر لەناو ئێوەدا بیست کەسی خۆگر ببن با دڵنیابن کە سەردەکەون بەسەر دووسەد کەسی دوژمندا واتە یەك بەدەیە، وەئەگەر لەناو ئێوەدا سەد کەسی وابن سەردەکەون بەسەر هەزارکەس لەوانەی کە بێ باوەڕن چونکە ئەوانە گەلێکن دەرکی ڕاستی‌وحەقیقەت ناکەن، بەڵێ پێویستە خاوەن باوەڕان بزانن کە سەرکەوتن هەمیشە بۆ باوەڕدارانی ڕاستەقینەیەو بێ باوەڕان شکان‌و لەناو چوون بەشیانە هەرچەندە بەهێزو پڕچەك وچۆڵە بن چونکە باوەڕداران دەزانن بۆچی شەڕ دەکەن‌و ڕێبازو ئامانجی خۆیان لەلا ڕۆشنەو دەزانن کە ئەوان ﷲ بەڵێنێ جێ نشینی پێداون بەڵام بێ باوەڕان هەرچەندە زۆرو پڕچەك‌و چۆڵش بن بەڵام نازانن بۆچی شەڕ دەکەن‌و ئامانجیان چیە جا تا باوەڕداران ئەو دەرکە باشەیان هەبێ هەریەکەی توانایی دەکەسی بێ باوەڕی هەیە، بەڵام وەختێ لەو دەرکە هاتنە خوارەوە لاواز دەبن‌و ئینجا یەك بەدوویە وەك دەفەرموێ:

(٦٦) ئێستا ﷲ ئەوبڕیارەی لەسەرسوك کردن‌و داواتان لێ ناکات کەلە بەرانبەری دەکەسەوە یەك کەستان بوەستێت، چونکە ﷲ دەزانێت لەناو ئێوەدا سستی‌و لاوازیەك پەیدا بووە جا ئیتر لەم کاتەدا ئەگەر لەناو ئێوەدا سەد نەفەری خۆگر هەبێ ئەوە سەردەکەون بەسەر دووسەد داو ئەگەر لەناو ئێوەدا هەزارکەسی وا هەبن سەر دەکەون بەسەر دوو هەزاردا بەیارمەتی ﷲ ی باڵادەست، بەڵام پاش باوەڕبوونی ڕاست، خۆگری گەورەترین مەرجی ئەو سەرکەوتنەیە چونکە بێگومان ﷲلەگەڵ خۆگراندایەو بەو خۆگرتنە ئەو پیرۆزی‌و سەرکەوتنانەیان پێ دەدات ،

* پێغەمبەری ئازیزمانﷺ کاتێ کە سوپای ئیسلام کە سێ سەدو چەن کەسێك بون‌و ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ سوپای کوفردا کە زیاتر لە نۆسەد کەس دەبون، هەستاو وڕەی موسڵمانانی بەرزکردەوەو فەرموی: {قُومُوا إِلَى جَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَوَاتُ وَالْأَرْضُ/ هەستن بۆ بەهەشتێك کە پانایەکەی بەئەندازەی پانایی ئاسمانان‌و زەوییە} لەو کاتەدا یەکێك لەیارەکانی کە ناوی عومەیری کوڕی حەمام بو، وتی: پانای ئاسمانان‌و زەوی؟! پێغەمبەری ﷺ فەرموی:{ نَعَمْ/ بەڵێ، وتی بەخ بەخ، پێغەمبەرﷺ فەرموی:{ مَا يَحْمِلُكَ عَلَى قَوْلِكَ بَخٍ بَخٍ/ چی وای لێ کردیت کەئەوبەخ بەخە بکەیت؟ وتی هیوادارم من پیاوی ئەو جێگابم، پێغەمبەرﷺ فەرموی: {فَإِنَّكَ مِنْ أَهْلِهَا/ سا بێگومان تۆ پیاوی ئەو جێگایتە، جا ئەو ئیتر پێشکەوت‌و کێلانی شمشێرەکەی شکاند تاجارێکی تر بەتەمای هەڵگرتنی نەبێ‌وچەند خورمایەکی لەتێشودانەکەی دەرهێناو دەیخواردو ئەوەی کە لە مشتیابوون فڕەی داو وتی:

بەراستی ئەگەرمن ئەوەندە بمێنم تا ئەم خورمانە دەخۆم ئەوە ژیانێکی درێژە ، جا چوە پێشەوەو شەڕیکرد تا شەهیدکرا/مسلم}.

بەڵێ ئەوان خاوەنی ئەو باوەڕە بەهێزەبوون بۆیە لەهیچ کۆسپێك سڵیان نەکردو مردنیان لە ڕێگای اللهُ دا لە لا لەهەموشت بەسودترو چاکتربو، بۆیە هەمو ملهوڕانو ستەمکارانو تاوانبارانیان تارو مارکردو ئەو کۆمەڵە بچوكو لاوازە بەماوەیەکی زۆرکەم بوون بەگەورەترین هێزی ناوچەو بوون بەجێگای هیواو ئومێدی چەوساوانی دەوروبەرو خەڵکیان لەبەندەپەرستیو داروبەرد پەرستی هێنا بۆ اللهُ پەرستیو بەندایەتیەکی پاكو خاوێن ، بەڵێ ئەم ڕوداوانەی باسکران ڕوداوی جەنگی بەدر بوونو بەرنامەی هەمیشەی موسڵمانانە تاقیامەتو پێویستە پەیڕەوی لێ بکەنو خاڵەکانی یەك بەیەك جێ بەجێ بکەنو خۆیان ئامادەبکەن بۆهەمو تەنگو چەڵەمەیەك لەسەر ئەو ئایینەو باکیان لەپڕو پاگەندەی دوژمن نەبێ ، چونکە دوژمن ، دوژمنەو هەرگیز تاریفی موسڵمان ناکات ، ئینجااللهُ سەبارەت بەگیراوەکانی بەدرو ئازادکردنیان بەفیدیە نارەزایی خۆی پیشان دەداتو دەفەرموێ:

(٦٧) هیچ پێغەمبەرێك مافی ئەوەی نەبوە کە هەوڵدات دوژمنان بگرێت بەدیلو پاشان بەفیدیە ئازادیان بکات ، بەڵکو پێویستە جەنگ بکات تا بەتەواوی ئایین سەقامگیروبەهێز دەبێت لەناو زەویداوخوانەناسان بەچاکی تەمێ بکات بۆئەوەی بێ باوەڕان چاوترسێن ببنو نەکەونە بیری فروفێڵو شەڕ کردن لەگەڵ موسڵماناندا، "شەڕ لەئیسلامدا بۆنەمانی شەڕە" ئینجا ڕوی فەرمودەکەی خۆی دەکاتە هەمو موسڵمانانو دەفەرموێ: ئێوە کەلو پەلی دنیاتان دەوێ؟! بەڵامالله دوا ڕۆژی بۆ ئێوە دەوێت ، وە اللهُ زۆر بەهێزەو ئیشەکانی بە حیکمەتە. جا دەفەرموێ:

(٦٨) ئەگەر لە پێشەوە بڕیاری اللهُ پێش نەکەوتایە کە لێتان خۆش دەبێو دەست گیریو بەندکردنی بێ باوەڕانتان بۆحەلاڵ دەکات دڵنیابن لەسەر ئەو فیدیە وەرگرتنە سزایەکی زۆر گەورەتان پێ دەگەیشت ،

ئیمام ئەحمەدو ئیمامی موسلیمو بێجگە لەوانیش بۆمان دەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە یارەکانی کرد لە"بەدر"دا سەبارەت بەوحەفتا کافرانەی کە گیرابون، ئەبوبکرخوالێی خۆشبێت وتی: عەفویان بکەو فیدیەیان لێ وەرگرە بەڵکو ئەمانە پەشیمان ببنەوەو باوەڕ بهێنن ، عومەر

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّمَن فِيٓ أَيۡدِيكُم مِّنَ ٱلۡأَسۡرَىٰٓ إِن يَعۡلَمِ ٱللَّهُ فِي قُلُوبِكُمۡ خَيۡرٗا يُؤۡتِكُمۡ خَيۡرٗا مِّمَّآ أُخِذَ مِنكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٧٠) وَإِن يُرِيدُواْ خِيَانَتَكَ فَقَدۡ خَانُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ فَأَمۡكَنَ مِنۡهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٧١) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَـٰٓئِكَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمۡ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيۡءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ وَإِنِ ٱسۡتَنصَرُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ فَعَلَيۡكُمُ ٱلنَّصۡرُ إِلَّا عَلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٞۗ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ (٧٢) وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۚ إِلَّا تَفۡعَلُوهُ تَكُن فِتۡنَةٞ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَفَسَادٞ كَبِيرٞ (٧٣) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ وَّنَصَرُوٓاْ أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ حَقّٗاۚ لَّهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ (٧٤) وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ مَعَكُمۡ فَأُوْلَـٰٓئِكَ مِنكُمۡۚ وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ (٧٥)

خوالێی خۆشبێت وتی: بیانکوژە ، عەبدوڵای کوڕی ڕەواحە وتی: ئەم شیوە داری زۆرەو ئاگرێك بکەرەوەو بیان سوتێنە پێغەمبەرﷺ ڕەئیەکەی ئەبوبکری پەسەند کردو بەفیدیە ئازادی کردن ، ڕۆژی پاش ئەو بڕیارە عومەر چوەلای پێغەمبەرﷺ دی لەگەڵ ئەبوبکرا دانیشتونو دەگرین، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ خۆتو ڕەفیقەت بۆچی دەگرین ، ئەگەر گریانم هات منیش دەگریم وەئەگەر گریانم نەهات خۆم دەگرییێنم بۆ گریانەکەی ئێوە فەرموی: بۆ ئەو بۆچونە دەگریم کە ڕەفیقەکانت بەمنیان وتو فیدیەم لەبت پەرستان وەرگرت، بەراستی پیشانم درا سزایەك کە نزیکتربو لەو درەختە کە پەنجەی بۆدرختێکی نزیکیان ڕاکێشا . ئینجا اللهُ ﴿ مَا كَانَ لِنَبِيٍّ _تا _ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ ﴾ ی بۆ ڕەوانەکردن.

واتە بۆ پێغەمبەرﷺ نیە هەوڵی گرتنی بێ باوەڕان بداتو نەیەوێ بیانکوژێت، ئێوە مەبەستتان دنیایەو اللهُ یش مەبەستی دوارۆژەو اللهُ بەهێزو دانایە. ئینجا دەفەرموێ:

(٦٩) دەی بخۆن ئەوەی کەوا دەستان کەوتوە لەماڵی کافران حەلاڵەو پاکە بۆتانو لە اللهُ بترسن چونکە بەبێگومان اللهُ لێ خۆشبوەو بەسۆزە بەرامبەر بەموسڵمانان.

بەم شێوەیە ﷲ دڵی باوەڕدارانی دایەوەو تێی گەیاندن ئەگەر چی ئیشەکەیان لە جێگای خۆیدا نەبوە بەڵام ﷲ چاوپۆشی لێ کردن‌و بۆ هەمیشەیش دەسکەوتەکانی شەڕی ئیسلامی حەلاڵ کرا بۆ پێغەمبەروﷺ ئەم گەلە وەك پێغەمبەرمانﷺ لە فەرمودەیەکدا کە بوخاری‌و موسلیم بۆمان دەگێڕنەوە ئەو یاسایە ڕۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ:{ أُعْطِيتُ خَمْسًا لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ قَبْلِي نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ وَجُعِلَتْ لِي الْأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا فَأَيُّمَا رَجُلٍ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلَاةُ فَلْيُصَلِّ وَأُحِلَّتْ لِي الْمَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً / پێنج شتم پێ دراوە بەهیچ پێغەمبەرێکی پێش من نەدراوە،

**یەکەم:** یارمەتی دراوم بەترس بەدووری یەك مانگ ڕێگا.

**دووهەم:**زەوی کراوە بەجێگای نوێژو پاك کەرەوە، جا هەر کەسێك لەم گەلەم لەهەرجێگایەکدا کاتی نوێژی هات با لەو جێگادا نوێژ بکات.

**سێهەم:** دەسکەوتەکانم بۆ حەڵاڵ کراوە کە بۆ هیچ کەسێکی تری پێش من حەڵاڵ نەکراوە.

**چوارەم:** شەفاعەتم پێ بەخشراوە شەفاعەتی گەورە.

**پێنجەم:**پێغەمبەر ڕەوانە دەکرا تەنها بۆتیرەو هۆزی خۆی بەڵام من ڕەوانە کراوم بۆلای هەمو خەڵك بەگشتی}

ئینجاﷲ دڵنەوایی گیراوەکانیش دەکات کە ئەگەر بێت‌ولەبێدینی پەشیمان ببنەوە ئایندەیان زۆر چاکتر دەبێ لەوەی کە تا ئێستا تێیدا بوون‌و ﷲ لە تاوانیان خۆش دەبێ‌و زیاتر لەوەش کە لێیان وەرگیراوە پیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

(٧٠) ئەی پێغەمبەرﷺ بەو کەسەی کە لەدەست ئێوەدان‌و گیراون بڵێ: ئەگەر بەراستی لە دڵیان دا راست بن لەگەڵ ﷲ دا سامانی چاکتر لەوسامانەی کە لێیان وەرگیراوە پێیان دەدات، سەرەڕای ئەوەش چاو پۆشی دەکات لە تاوانەکانیان چونکە بەراستی ﷲ زۆر لێ خۆشبوو میهرەبانە سەبارەت بە بەندەکانی‌و ئەوەتە ئەوانەی کە دوژمنایەتی ﷲ و پێغەمبەرو موسڵمانایان کردوەو هاتون بۆ شەڕو پاشان بەدیل گیراون دەفەرموێ: مادەم بەدڵ پەشیمان ببنەوە ئەو مژدە خۆشەیان پێ بدە هەم لە دنیادا بۆیان قەرەبوو دەکاتەوەو هەم لە تاوانەکانیشیان خۆش دەبێ ئاشکرایشە مادەم لە تاوانیان خۆش ببێ دەیانخاتە بەهەشتەوە کەواتە هەم لە دنیادا پاداشت دەدرێنەوە هەم لە دوا رۆژیشدا ، دەگێڕنەوە کە عەباسی مامی پێغەمبەرﷺ کەیەکێك بو لە گیراوەکان پاش ئەوەی کەمایەوەو موسڵمان بو جارێکیان ماڵێکی زۆر لە بەحرەینەوە هات بۆ پێغەمبەرﷺ و گەیەشتە مزگەوت‌و بانگدرا پێغەمبەرمانﷺ ئاوڕی لە ماڵەکە نەدایەوە هەتا لە نوێژەکە بویەوە، ئینجا چویە سەر ماڵەکەو چاوی بەهەرکەس کەوت بەشی دا عەباس هات وتی: بەشم بدە من کاتی خۆی فیدیەی خۆم‌و عەقیلیشم داوە ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ببە ، جا ئەویش توشەبەرەیەکی چوارگۆشەی پێ بو پری کرد ، جاوەختێ ویستی هەڵیگرێت نەیتوانی‌و وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ بڵێ: بابیدەنە کۆڵم، فەرموی: نابێ، وتی: خۆت بیدە کۆڵم. فەرموی: نابێ ، ئینجا هەندێکی لێ داکردەوەو باقیەکەی دابەشانیاو ڕۆی، پێغەمبەرﷺ چاوی تێ بڕی بو سەری سوڕما لەو تەماع بازیەی جا دەڵێن: عەباس دەیووت ئەوە مژدەی یەکەممان دەست کەوت نازانین مژدەی دووهەممان چۆن دەبێ ، هیوادارم ﷲ لێمان خۆش ببێت ، ئینجا ﷲ پێغەمبەرمانﷺ دڵنیا دەکاتەوە کە خیانەتکاران بەسزای خیانەتی خۆیان دەگەن‌و دەفەرموێ:

(٧١) جا ئەم جەماعەتە گیراوەو باقی بێ باوەڕانی تر ئەگەر بیانەوێ خیانەتت پێ بکەن تۆ مەترسە لێیان چونکە ئەوان لە پێشدا خیانەتیان کرد لەگەڵ ﷲداو هەرچی هێزو تواناییان بو دژی ئایین‌و تۆ ئەنجامیان دا ، بەڵام ئەوەبو ﷲ تۆڵەی لێ کردنەوەو بەئاسانی ئەوانی خستە بەردەستتان‌و بەدەستی ئێوە سەرشۆڕو داماوی کردن، چونکە ئەوان خیانەتکارو نیەت پیس بون ، وەبەبێگومان کە ﷲ زانایەو ئیشەکانی زۆر بەحیکمەتە جا ئەوەی نیەتی باشی هەبێ ﷲ پێی دەزانێ‌و پاداشتی باشی پێ دەدرێت وەئەوەش کە نیەتی خراپی هەبێ بەونیەتەی خۆی رەفتاری لەگەڵدا دەکرێت‌و ﷲ هیچی لێ پەنا نادرێت‌و هیچی لە بیرناچێتەوەو هەمو جموجوڵێك بەگوێرەی زانیاری ئەوەدەبێ هەر ئیشێکیش دەکات هەموی چاکەو جێگای خۆیەتی چونکە (علیم حکیم، زۆرزانایەو زۆردانا) .

ئینجا ﷲ خاوەن باوەڕان دەکات بەسێ بەشەوەو دەفەرموێ:

(٧٢) بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردوەو بەماڵ‌و بەگیانیان لە ڕێگای ﷲ دا جیهادیان کردوە کە کۆچەرییەکانی مەکە بۆ مەدینە سەرقافڵەی هەمو کۆچکەرانن ئەوسا ئەوانەی کە جێگایان بەوان داوەو یارمەتیان داوون ، کە موسڵمانانی مەدینە زەق ترین مانای ئەم ئایەتەیە ئائەوانە

هەندێکیان سەرپەرشتو دۆستو یارمەتی دەری هەندێکیانن‌و جیانین لەیەك ، وەئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بەلام کۆچیان نەکردووە لە مەکەدا ماونەتەوە ئەوانە مافی خۆیانیان سوتاندووەو پەیوەندی خۆیانیان بچڕاندوە ، هیچ دۆستایەتی‌و یارمەتی دانێك لە نێوان ئێوەو ئەواندا نەماوە تا ئەوانیش کۆچ نەکەن، وەئەگەر داوای یارمەتیان لێ کردن بۆ مەبەستێکی ئایینی ئەوە پێویستە لە سەرتان کە یارمەتیان بدەن‌و بەهانایانەوە بڕۆن‌و نابێ کۆچ نەکردنی ئەوان لەم بارەوە تەگەرە بۆ ئێوە دروست بکات مەگەر بۆ دژایەتی گەلێك بێ کە ئەو گەلە لە نێوان ئێوەو ئەواندا پەیمانی ئاشتی هەبێت لەم شێوەدا باداوای یارمەتیش لە موسڵمانانی کۆچەری‌و یارمەتیدەر بکەن نابێ وەڵامیان بدەنەوە چونکە خیانەت‌و پەیمان شکاندنە‌و لە پێشەوە فەرموی:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْخَآئِنِينَ/ بێگومان کەاللهخیانەتکارانی حۆشناوێت﴾

کۆمەڵی دانیشتو مافی ڕەخنەگرتنیان نیە لەو موسڵمانە کۆچەری‌و یارمەتی دەرانە چونکە ئەمانە بەهۆی سستی‌و کەم تەرخەمی‌و پشتگوێ خستنی کۆچ‌و جیهادو یارمەتی نەدانی موجاهیدانەوە مافی خۆیان سوتاندووەو پەیوەندی نێوانی خۆیان‌و باقی موسڵمانانیان بچڕاندوەو پێویستە لۆمەی خۆیان بکەن‌و جارێکی تر هەلۆێستی ئاوا بێ کەڵك‌و بێ نرخ نەگرن ، شێرەپیاوانی مەیدانیش نابێ نەفس‌و شەیتان زاڵ بێ بەسەریانداو گوێ بەپەیمان نەدەن ئەوەتە الله لە کۆتای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ئەوسا الله بەوەی کە ئێوە دەیکەن بینەرە واتە چاوی لەهەموو هەڵس‌و کەوتێکتانەو دەبێ ئاگاتان لە خۆتان بێ بەشێوەیەك ڕەفتارنەکەن کە پێچەوانەی فەرمانی ئەوبێت جا بۆ ئەوەی موسڵمانان زیاتر سوربن لەسەر یەکبوون‌و یەك دەستی‌و یەکڕیزی، دەفەرموێ:

(٧٣) خۆ ئەوکەسانەی کە کافرن هەندێکیان یارمەتی دەرو دۆستی هەندێکیانن ئەگەر ئێوەش ئاوانەکەن‌و پشتگیری یەکتر نەکەن‌و دۆستو یارمەتی دەری یەکتر نەبن‌و هەندێکتان سەرپەرشتی هەندێکتان نەکەن ئیتر ئێش‌و ئازاری خاوەن باوەڕان‌و شیرك و بت پەرستی ڕەنگاو ڕەنگ سەرزەوی داگیردەکات‌و خراپەکاری‌و تاوانی گەورە دەکرێت‌و لەباتی حاکمیەتی الله دا حاکمیەتی ملهوڕو تاغوتان دەبێت‌وفەسادو خراپە وەك ئەمرۆ هەموو کون‌و قوژبنێك دەگرێتەوە ، دووبارە دەگەڕێتەوە سەر باوەڕداران‌و دەفەرموێ:

(٧٤) جا ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو لەرێگای الله دا کۆچ‌و جیهادیان کردوە ، وەئەوانەی کە جێگایان کردونەتەوەو یارمەتیان داون بەراستی ئا ئەوانە باوەڕداری ڕاستەقینەن‌و بۆئەوان هەیە لێ خۆشبون‌و ڕۆزییەکی بەڕێزو بە بەرەکەت وهەمیشەیی‌و دوانەهاتو.

ئینجاالله باوەڕدارانی پاش ئەوان باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٧٥) خۆ ئەوانەش کە باوەڕیان هێنا لەپاش ئەوان‌و کۆچیان کردو لەگەڵ ئێوەدا جیهادیان کرد لە ڕێگای الله دا ئەوە ئەوانیش لە ئێوەن‌و پاداشتی وەکو ئێوەیان هەیە لەسەر ئەو کۆچ‌و جیهادە، ئەم کۆچ کردنە تا فەتحی مەکە بوە پاش فەتحی مەکە نەماوە تا ئەو کاتەی کە حاکمیەتیالله هەبوە واتە تا چەرخی سیانزەی کۆچی بەلام پاش نەمانی حکومەتی الله و زاڵ بوونی کوفر بەسەر وڵاتی ئیسلامیداو بەندایەتی تاغوت هاتەوە مەیدان کاری ئیسلامی وەکو سەردەمی کۆنی لێ هات‌و کۆچکردن بۆ پاراستنی عەقیدەو بیرو باوەڕ پێویستە(الْهِجرَةُ مَاضٍ إِلَى يَومِ القِيَامَةِ/ کۆچکردن بەردەوامە هەتا ڕۆژی قیامەت)

وە فەمودەی پێغەمبەرمان هاتەدی: { بَدَأَ الإِسْلَامُ غَرِيبًا وَسَيَعُودُ كَمَا بَدَأَ غَرِيبًا فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ/مسلم والترمذي/ ئیسلام لەسەرەتاوە بەغەریبی دەستی پێ کردوەو بەمزوانەش دەست پێدەکاتەوە بە غەریبی جاخۆشبەختی بۆ ئەوغەریبانە}ئینجا قورئان پاش پەیوەندی بیرو باوەڕو عەقیدە باسی پەیوەندی خزمایەتی دەکات‌و دەفەرموێ: خزمەکان هەندێکیان لە پێشترن لە هەندێکی تریان لە بڕیارو فەرمانی الله دا.

بەم شێوەیە کەلە پوربردن بە هاوسوێنخواری وبرایەتی هەڵوەشایەوە ، سا بێگومان اللهزانایی هەیە بەسەر هەمو شتێکدا. وەئەم بڕیارەی وەلام دەرەوەی هەستی ناودەرونی مرۆڤە واتە وەڵام دانەوەی هەست‌و سۆزەکانی مرۆڤ شتێکی ڕەوایە بەو مەرجەی زیان بە عەقیدەو باوەڕ نەدات ، سەرەتا پەیمانیان دەبەست یان بڕیاریان دەدا کە برای یەکتربن ئیتر بەم شێوەیە کەلە پوریان لەیەکتر دەبرد بەلام ئەم ئایەتە هات‌و ئەو حوکمەی هەڵوەشاندەوەو دەری خست کەئەوە بڕیارێکی کاتی بووەو ئێستا ئیتر کاتی بەسەر چووەئیشی پێ ناکرێت‌و خزمایەتی نەسەبی پێش ئەو جۆرە پەیوەندیانە دەخرێت.

تەواوبو پاش عەسری چوارشەمە ڕێکەوتی ٢١/محرم/١٤٢٢هاوینە هەواری سەلاحەدین.

٩ سُوۡرَةُ التَّوۡبَةِ ١٢٩

بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١ فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱللَّهَ مُخۡزِي ٱلۡكَٰفِرِينَ ٢ وَأَذَٰنٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلنَّاسِ يَوۡمَ ٱلۡحَجِّ ٱلۡأَكۡبَرِ أَنَّ ٱللَّهَ بَرِيٓءٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ وَرَسُولُهُۥۚ فَإِن تُبۡتُمۡ فَهُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ وَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّكُمۡ غَيۡرُ مُعۡجِزِي ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ٣ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ثُمَّ لَمۡ يَنقُصُوكُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَمۡ يُظَٰهِرُواْ عَلَيۡكُمۡ أَحَدٗا فَأَتِمُّوٓاْ إِلَيۡهِمۡ عَهۡدَهُمۡ إِلَىٰ مُدَّتِهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ٤ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٥ وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ ثُمَّ أَبۡلِغۡهُ مَأۡمَنَهُۥۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡلَمُونَ ٦

٩ سورەتی تەوبە ١٢٩

سورەتی تەوبە كە سورەتی نۆیەمی قورئانە لە ساڵی نۆیەمی كۆچی دا لەمەدینەدا هاتوەتە خوارەوە و سەدوبیستونۆ ئایەتەو هەندێك وتوویانە دواترین سورەتە كە دابەزیوە بەڵام هەندێكیش پێیان وایە ئەم سورەتە پێش سورەتی النصر دابەزیوەو سورەتی نەصر دواترین سورەتە، ئەم سورەتە تا كە سورەتێكی قورئانە كە بە ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ دەست پێناكات چونكە ، ئەم سورەتە بێزاری خواو پێغەمبەرە ﷺ لە بت پەرستانو كافرانو سەرجەم رسوا كردنی دووڕووەكانە، واتە - رقوقینی ﷻ یە لە تاوانبارانو ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾ یش بەڵگەی سۆزو میهرەبانی ﷻ یە كەلێرەدا گونجاو نیە بۆیە نەوتراوە، هەر خوایش زانایە.

ئەم سورەتە(**براءة** **وت**)یش پێ وتراوە چونكە لە كۆتایی سورەتەكەوە خوا تەوبەی لە تەواوی موسڵمانان بەكۆچەریو یارمەتی دەرەوە لە گەڵ پێغەمبەرماندا ﷺ وەرگرت بەتایبەتی تەوبەی ئەو سێ كەسەی كە راستیان وتو پێغەمبەرمان ﷺ دوای خستن تا خوا فەرموی: تەوبەم لێ وەرگرتن. وە(برائەتی)پێ وتراوە، چونكە سەرەتای سورەتەكە بەبێزاریو بەری بونی خوداو پێغەمبەرەكەی ﷺ لە موشریكان دەست پێ دەكاتو چەندین ئایەتی هەر لەسەر ئەوان دەڕوات. وە( **وت**)ی پێ وتراوە چونكە باسی چۆنیەتی هەڵسو كەوتی دووڕوەكان دەكاتو بەشێكی زۆری سورەتەكەی گرتوەتەوە.

سەرەتای ئەم سورەتە لەپاش گەڕانەوەی پێغەمبەرمان ﷺ لە غەزای تەبووك هاتە خوارەوەو ویستی ئەو ساڵە حەج بكات بەڵام كاتێ وتیان بت پەرستان هەروەكو باوی خۆیان دێن بۆحەج و ئەوان بەڕوتی بەدەوری كەعبەدا ئەسوڕێنەوە پێغەمبەر ﷺ پێی ناخۆش بو بچێت بەڵام لەحیاتی خۆی ئەبوبكری ئەمساڵە نارد كە ئەمیری حاجیان بێ تا جێگای عیبادەتەكان دیاری بكات بۆ خەڵكو بە موشریكانیش رابگەیەنێ كە نابێ پاش ئەم ساڵ بێن بۆ حەجو ئەم چەندئایەتەی(بەرائەت)كە هاتوەتە خوارەوە بۆیان بخوێنێتەوە، كاتێ هاتەوە مەدینە علی یشی نارد تا ئەو لەجیاتی پێغەمبەر ﷺ ئەو شتانە رابگەیەنێ ، چونكە علی خزمی نزیكی پێغەمبەر ﷺ بو باوی ئەو سەردەمەیش وابو پەیمان هەڵوەشاندنەوە بەدەستی گەورەی سەردەم بو جا ئەگەر خۆی نەبوبێ ئەبێ كەسێكی خزمی نزیكی، ئەو هەڵوەشاندنەوەی رابگەیاندایە.

(١) ئەمە بێزاری خواو پێغەمبەرەكەیەتی كە ئاشكرای دەكات بۆ ئەوانەی كە پەیمانیان داوە بە پێغەمبەر ﷺ لە بت پەرستانو پێیان رادەگەیەنێ كە

(٢) بەئازادانە بەسەر زەویدا تا چوار مانگ بگەڕێنو پاش ئەوە ئیتر پەیمان نامێنێ بێجگە لەوانەی كە پەیمانی زیاتر لە چوار مانگیان هەیە ، دەبزانن بێگومان ئێوە ناتوانن خوا دەستە پاچە بكەنو رێگای ئەنجامدانی كارەكانی لێ بگرن مادام ئێوە سوربن لەسەر كوفرو خیانەت خوا تۆڵەتان لێ وەر ئەگرێت چونكە بێگومان ﷻ سەرشۆڕكەری كافرانو بت پەرستانو خوانەناسانە هەرچەندە تواناو هێزو پشتیان هەبێ لەدەستی تۆڵەی خوا رزگار نابن ،

ئەبوهورەیرە ئەڵێ من لەگەل "عەلی" دابوم ئەوكاتەی كە پێغەمبەر ﷺ ناردی بۆ ئەوەی كەپەیامی پێغەمبەر ﷺ بگەیەنێت بە حاجیان جا لەوێ چوار وشەی پێ راگەیاندنو ئەوەندەی دووبارە كردەوە تادەنگی نوسا كەبریتی بون لە:{ **أَلَا إِنَّهُ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ وَلَا يَحُجَّنَّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ وَلَا يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ وَمَنْ كَانَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَهْدٌ فَإِنَّ أَجَلَهُ إِلَى أَرْبَعَةِ أَشْهُرٍ فَإِذَا مَضَتْ الْأَرْبَعَةُ فَإِنَّ اللهَ بَرِيءٌ مِنْ الْمُشْرِكِ وَرَسُولُهُ**/صححه الالبا / ئاگادار بن بیجگە لەباوەڕدار هیچ كەسێكی تر ناچێتە بەهەشتەوەوپاش ئەمساڵ نابێت موشریك حەج بكاتو نابێ بەڕوتی بەدەوری بەیتدا بسوڕێتەوە ، وەهەركەسێك كەلەنێوان ئەوو لەنێوان پێغەمبەری خوادا پەیمانێكی هەیە ماوەكەی

تاچوارمانگە جا کە ئەوچوارمانگە چو ئەوسا بێگومان کە ﷲ وپێغەمبەرەکەی بێوەرین لەموشریکان}
هەروەك دەفەرموێ:

(٣) ئەمە بانگەوازێکە لەلایەن خواو لەلایەن پێغەمبەرکەیەوە بۆ هەمو خەڵك لە رۆژی حەجی گەورەدا کە رۆژی چەژنی قوربانە کە ئەویش ئەمەیە: کەبەبێگومانﷲ بێزارە لە بت پەرستان هەروەها پێغەمبەرکەیشی چونکە ئەوەندە خراپەکاریو دژایەتی ئاینیو پەیمان شکاندنو نالەباریيان کردووە خوا لەوەزیاتر ماوەیان پێ نادات‌و بێزاری خۆی‌و پێغەمبەرەکەی لەوان رادەگەیەنێ‌و لەهەمان کاتیشدا هەڵیان دەنێ بۆ تەوبەکردن‌و گەڕانەوەو دەفەرموێت: جا ئەگەر بگەڕێنەوەو واز لە بت پەرستی بهێنن ئەوسا هەرئەوە چاکە بۆتان‌و ئەکەونە سەررێگای خۆشبەختی هەردوو جیهان ، وەئەگەر پشت بکەنە ئایین‌و هەر بەو رەوشتە ناپەسەندەی خۆتان درێژەبدەن دەی با بزانن کەبەبێگومان ئێوە ناتوانن ﷲ دەستە پاچە بکەن هەرچی بکەن‌و هەرچۆن ببن بەراستی خوا تۆڵەتان لێ دەستێنێ جا بەشێوەی گاڵتە پێ کردنیان دەفەرموێت: سا مژدە بدە ئەی محمدﷺ بەوانەی کەکافرن بەسزایەکی دەردناك. لە راستیدا موژدە بۆ خۆشیە نەك بۆ ناخۆشی جا ئەمە گاڵتە پێ کردنە بەوان ، چونکە ئەوان گاڵتە بە خواو ئایین وپێغەمبەرو پەیرەوانی دەکەن بۆیە بە شێوەی کردارەکەی خۆیان سزا دەدرێنەوە.

بەڵێ پاش ئەم جاڕدانە بت پەرستان قەدەغەکران لە گەڕان بەدەوری کەعبەداو هەروا قەدەغە کرا بەڕوتی بەدەوری کەعبەدا بسوڕێنەوە ، جێگای باسە ئەوانەی کەئەمڕۆ ئافرەتیان روتکردوەتەوەو داوای روت بونەوەی زیاتریان بۆ دەکەن لاف پێش کەوتن لێ دەدەن‌و ئیسلام‌و پەیڕەوانی بە پاشکەوتوو ناوئەبەن لە حاڵێکدا کە ئەوانە دەیانەوێ دابو نەریتە کۆنەکان زیندو بکەنەوەو بەپێشکەوتن‌و شارستانی‌و زانیاریانەیان دەرخواردی خەڵکی ساویلکەو نەزانی بدەن، ئیسلام هات روتی ئافرەت‌و شەرواڵ پیسی‌و ئارەق خواردن‌و قومارکردنی قەدەغەکرد واتە ئەوانە رەوشتی سەردەمی نەزانین بون ، ئێستا ئەیانەوێ بەشتێکی تازەو نوێ بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن؟! ئایا کاتی ئەوە نیە رۆڵە تازە پێگەیشتوەکانی ئەم سەردەمە قۆڵی مەردانە هەڵکەن‌و ئەو دابو نەریتە کۆنە بسڕنەوەو لە حەیوانیەو بیانگەڕێننەوە بۆ ئینسانی؟ بەراستی بەخەوو خواردن‌و بەرەڵلایی مرۆڤ پێش ناکەوێت، چونکە حەیوانیش لەو بوارەدا دەستێکی باڵای هەیە مرۆڤ هەرچی بکات لەخواردن‌و خەوداهێشتا ناگاتە تۆزی قولی هەندێ لە حەیوانات؟! جا بۆ ئەبێ خەڵکی ئابەوشێوەیە چەواشە بکرێت؟! ئەی ژیری‌و زانایی لە کوێیە؟! جا پاش ئەوەی کە فەرموی خواو پێغەمبەرکەی بێزارە لە بت پەرستان‌و ماوەی چوار مانگ مۆڵەتی دان تا بۆ خۆیان بیر بکەنەوە جا ئەگەر تەوبەیان کرد خۆ چاکە ئەگینا لە سزای خوا رزگار نابن پاش ئەوە خاوەن پەیمانەکان ئەکات بەدوو بەشەوە بەشێکیان ئەوانەن کە پەیمانەکانیان نەپاراستوە ئەوە پاش ئەو چوار مانگە ماوەی پەیمانەکانیان نامێنێ. بەشەکەی تریان ئەوانەن کە پەیمانەکانیان پاراستوەو دژایەتی پێغەمبەرﷺ و باوەڕدارانیان نەکردوە ئەوە پەیمانەکانیان ئەمێنێتەوە وەك دەفەرموێ:

(٤) مەگەر ئەوانەی کە پەیمانیان پێداون لە بت پەرستان‌و لە پاشان لەو پەیمانە هیچ شتێکیان کەم نەکردوەتەوەو بەرێك‌و پێکی پەیمانی خۆیان پاراستوەو یارمەتی هیچ کەسێکیان نەداوە دژی ئێوە ئەی موسڵمانان دەی ئێوەش تەواو بکەن ماوەی پەیمانەکانیان‌و هیچی لێ کەم نەکەنەوە چونکە بەبێشك کە ﷲ پەرهێزکارانی خۆش دەوێت. ئینجا ﷲ دەفەرموێت:

(٥) جا هەرکاتێك ئەو چوار مانگە قەدەغەکراوەی کە بەموشریکان درا کۆتای پێ هات‌ولەبت پەرستی نەگەڕانەوە جا ئیتر ئەوان هیچ بەهانەیەکیان نامێنێ ئەوسا موشریکان لەهەرکوێدا دەستان کەوتن بیانکوژن و بیان گرن‌و گەمارۆیان بدەن‌و لە هەمو شوێن‌وڕێگاو بانێکدا کەمینیان بۆدابنێن و لێیان بدەن جا ئەگەر هاتو تەوبەیان کردو گەڕانەوەو نوێژیان کردو زەکاتیان دا ئەوسا ئەوکاتە وازیان لێ بهێنن، واتە پەشیمان بونەوەی دەم بەڵگە نیە بەڵکو پێویستە ئەو دوو شتەیش کە نوێژو زەکاتە ئەنجامی بدەن ئینجا ئەبێ وازیان لێ بهێنرێ چونکە بەبێگومان کە ﷲ زۆر لێ خۆشبوو بەسۆزە سەبارەت بەبەندەکانی، ئەمە فەرمانی خوایە سەبارەت بە موشریکان‌و بێ باوەڕان‌و هەتا رۆژی دوایی ئەمێنێتەوەو هەرگیز هەڵناوەشێتەوە نەبەدادگەری دادگەران نەبە ستەمی ستەمکاران، ئینجا شێوەیەك لە شێوەکانی راگەیاندنی ئایین باس دەکات بۆ خاوەن باوەڕان کەبەراستی رونترین بەڵگەی ئازادی‌و مرۆڤ دۆستی‌و دەست‌و دەم پاکی خاوەن باوەڕانی ئەم ئایینە بە نرخە ئەگەیەنێ‌و دەفەرموێ:

(٦) جا ئەگەر یەکێك لە بت پەرستان داوایان لێ کردیت کە پەنایان بدەیت‌و ببنە هاوسێت‌و مەبەستی خراپەکاری‌و جاسوسیان نەبو سا تۆش بەدەراوسێتی ئەورازی ببەو پەنای بدە بۆ ئەوەی کە فەرمودەکانی خوا ببیستێ بەڵکو باوەڕبهێنێ‌و لەتاوان‌و بت پەرستی رزگاری ببێ ، دیارە ئەگەر باوەڕی هێناو

كَيۡفَ يَكُونُ لِلۡمُشۡرِكِينَ عَهۡدٌ عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ رَسُولِهِۦٓ إِلَّا ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّمۡ عِندَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِۖ فَمَا ٱسۡتَقَٰمُواْ لَكُمۡ فَٱسۡتَقِيمُواْ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٧﴾ كَيۡفَ وَإِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ لَا يَرۡقُبُواْ فِيكُمۡ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ يُرۡضُونَكُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَتَأۡبَىٰ قُلُوبُهُمۡ وَأَكۡثَرُهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٨﴾ ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩﴾ لَا يَرۡقُبُونَ فِي مُؤۡمِنٍ إِلّٗا وَلَا ذِمَّةٗۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُعۡتَدُونَ ﴿١٠﴾ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿١١﴾ وَإِن نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُم مِّنۢ بَعۡدِ عَهۡدِهِمۡ وَطَعَنُواْ فِي دِينِكُمۡ فَقَٰتِلُوٓاْ أَئِمَّةَ ٱلۡكُفۡرِ إِنَّهُمۡ لَآ أَيۡمَٰنَ لَهُمۡ لَعَلَّهُمۡ يَنتَهُونَ ﴿١٢﴾ أَلَا تُقَٰتِلُونَ قَوۡمٗا نَّكَثُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ وَهَمُّواْ بِإِخۡرَاجِ ٱلرَّسُولِ وَهُم بَدَءُوكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٍۚ أَتَخۡشَوۡنَهُمۡۚ فَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخۡشَوۡهُ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٣﴾

موسڵمان بو ئیتر جیاوازییەك لە نێوان ئەوو باقی موسڵمانانی تردا نامێنیٚو ئارەزۆی خۆیەتی لە هەرجێگایەکی وڵاتی ئیسلامیدا دانیشیٚوکاروباری ژیانی خۆی ببات بەرێوە، بەڵام ئەگەر باوەڕی نەهێنا نابیٚ لەو جێگایەدا دەست درێژی بکرێتە سەرو سزا بدرێت بەڵکو پێویستە ژیانو ماڵی بپارێزرێت وەك دەفەرمویٚ: لەپاشان بیگەیەنە شوێنی هێوربونەوەی خۆی.

ئابەو شێوەیە ئیسلام مافی مرۆڤ ئەپارێزیٚو پەیمانی خۆی بۆ هیچ شتێك ناشکێنیٚ ئەگەر زۆر گرنگیش بێت وەك پێغەمبەرمانﷺ فەرمان دەداتو دەفەرمویٚ:{لاتخُنْ مَنْ خَانَكَ/ أبوداودۀ ە، صحه الالبا /خیانەت مەکە لەگەڵ ئەو کەسەی کەخیانەتت لەگەل دا دەکات} بۆ؟ چونکە ئەوانە گەلێکن کە نازاننو هەستی گرنگی ئەم ئایینە بەنرخە ناکەنو پێشەکیش بەشێوەی پەنا دان هاتوون جا نابیٚ خیانەتیان پیٚ بکرێت.

**یەکەم**: تا هەرکەسێك کەبیەویٚ لە ئایین تیٚ بگات بیٚ ترس بەپەیمان وەرگرتن لە موسڵمانان بێتەناو وڵاتی ئیسلامیەوەو دڵنیابێت کە گیانو ماڵی پارێزراوە هەتا خۆی خیانەت نەکات.

**دووهەم**: تا دەرکەوێت ئایینی ئیسلام ئایینی تاکەکەس نیە باکابرایش باوەڕ نەهێنیٚو موسڵمانەکەش رقی بیٚ لێی نابیٚ دەست درێژی بکاتە سەری چونکە خوا ئاوا فەرمانی پیٚ دەدات.

**سێهەم**: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زۆر لەکەس ناکرێت بۆ باوەڕ هێنان بەمانای(﴿ لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ ﴿٢٥٦﴾ ﴾) ئینجا ﷲ دەفەرمویٚ:

﴿٧﴾ چۆن دەبیٚ هاوەڵ پەیدا کەران پەیمانیان هەبیٚ لەلای خواو پێغەمبەرەکەیﷺ؟ واتە شایستەی ئەوەنین ئەوان بەپەیمان دڵنیا بکرێن لەلایەن خوداو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ مەگەر ئەوانەی کەوەختی خۆی پەیمانتان پیٚ داون لەلای "بەیت" دا واتە ئەوانەی کەلە ئاشتی حودەیبییەدا پەیمانتان پێدان جا ئەوانە تا راست ئەوەستن لەسەر پەیمانەکانیانو هەڵوێستی خۆیان ناگۆڕن ئێوەش لەسەر پەیمانی خۆتان بمێننەوەو نەیشکێننو لە خوا بترسن چونکە بێگومان ﷲ پەرهیزکارانی خۆش دەوێت. ئینجا باسی دڵ پیسی بیٚ باوەڕو بت پەرستان سەبارەت بە موسڵمانان دەکاتو دەفەرمویٚ:

﴿٨﴾ چۆن دەبیٚ بت پەرستان پەیمانو عەهدیان لەگەڵ خواو پێغەمبەردا بیٚو بەئاسودەیی بژین لەگەڵ ئەوەدا کە ئەگەر ئەوان سەرکەون بەسەر ئێوەدا بەزەییان بەئێوەدا نایەتەوەو هیچ سوێندو پەیمانێکیش کەلە نێوان ئەوانو ئێوەدا بێت لەبەرچاو ناگرنو بەهەمو شێوەیەك ئازارتان دەدەن، بەڵام لەکاتی بیٚ دەسەڵاتیدا خۆیان زۆر بەدۆستو دڵسۆز پیشان دەدەنو بەدەم ئێوە رازی دەکەنو قسەو رەفتاری وادەنوێنن کە گوایە ئەوان دۆستی باوەڕدارانن؟! بەڵام ئەمە رواڵەت سازییەو راست نیەو دڵو دەمیان یەك نیە وەك ئەفەرمویٚ: وەدڵەکانیان بێزارە لەو قسەو رەفتارە بەڕواڵەت باشانەیانو زۆربەی ئەوانە فاسقنو لە سنوری ئایینو خواپەرستی دەرچوونو هەرگیز بە دۆستایەتی باوەڕداران رازی نین ئەمانە،

﴿٩﴾ بە ئایەتەکانی ﷲ بەهەرەیەکی کەمیان کڕیوە واتە لە باتی گوێڕایەڵیو ئەنجامدانی فەرمانەکانی خودا دژایەتی ئایەتەکان دەکەن بەوەشەوە ناوەستن بەڵکو ئەوان رێگای بڵاوبونەوەی ئایینی خودایان گرتوەو ماوە نادەن کە خەڵك وەری گرێت بەراستی ئەوانە خراپترین ئیشیان کردوەو.

﴿١٠﴾ ئەوان هەرگیز هیچ سوێندو عەهدو پەیمانێك ناپارێزن ئەگەر دەسەڵاتیان هەبیٚ، چونکە زۆر رقیان لە باوەڕدارە.

هەرلەم نزیکەدا ئەوە دووجار هەمان مەبەست باسکرا تا خاوەن باوەڕان وریا بنو دڵنیا نەبن لە دوژمنانی خواو پێغەمبەرو ئایین ، چاکیش بزانن کە دوژمنان ئەگەر ئامادەی پەیمانو عەهد ببن ناچارنو هەرکە زانیان توانای دوژمنایەتیان هەیە یەك چاو تروکان دێرناکەن بۆیە قورئان پاش ئەو رون کردنەوەیە دەفەرمویٚ: چاك بزانن ئائەوانە خۆیان دەست درێژکەرن. ئەمە وەسفێکی هەمیشەیی بیٚ باوەڕانو بت پەرستانە، تا بیٚ باوەڕ بن، نابیٚ باوەڕیان پیٚ بکرێتو دۆستایەتیان لەگەڵدا بکرێت بەڵام ئەگەر باوەڕیان هێنا ئەو وەسفەیان دەگۆڕیٚ، وەك دەفەرمویٚ:

(١١) ئەگەر ئەوان تەوبەیان کردو گەڕانەوە لەو خراپەکاری‌و تاوانانەی خۆیان‌و نوێژیان کردو زەکاتیان دا ئیتر ئەوانە برای دینیتانن‌و نابێ هیچ شتێك بمێنێ لە نێوانتاندا، پاش ئەوەی کەئەم یاساو فەرمانانەی بۆ باسکردن دەفەرموێ: وە ئاوا ئایەتەکانمان درێژە پێ دەدەین‌و ڕۆشنی دەکەینەوە بۆ ئەو گەلەی کە بزانێت، چونکە زانایان ئەتوانن لەراستی‌و دروستی ئەم یاساو فەرمانانەی ﷲ تێبگەن‌و بۆ خەڵکی ڕۆشن بکەنەوە. ئینجا دەفەرموێ:

(١٢) خۆ ئەگەر پاش ئەو عەهدو پەیمانەی کەداویانە شکاندیانەوەو تانەوتەشەریان دا لە ئاینەکەتان ئەبێ ئێوەش مەردانە لەوان ڕاپەڕن‌و سەرانی کوفر بکوژن ، چونکە ئەمانە زیانیان زۆرە بۆ ئایین‌و بەڵگەیشە لەسەر ئەوەی کەهەرکەسێك تانەو تەشەری دا لە ئایین بە سەرانی کوفر تەماشا دەکرێت ، بەڵێ ئەبێ ئەو تاوانبارانە بکوژرێن چونکە ئەوانە خاوەنی هیچ عەهدو پەیمانێك نین بەڵکو ئەوانیش لە خراپەکاری‌و دەستدرێژی کردنە سەر موسڵمانان‌و تانەو تەشەردان لە ئایین واز بێنن، ئینجا خوای زاناو باڵادەست موسڵمانان هەڵدەنێ‌و دەفەرموێ:

(١٣) ئایا ئێوە شەڕ ناکەن لە دژی گەلێك کە پەیمانی خۆیانیان شکاندووەو ویستویانە کە پێغەمبەرﷺ دەربکەن واتە ئەو بت پەرستانەی مەکە ، خۆ ئەوان لە پێشەوە هێرشیان کردوەتە سەر ئێوە واتە ئایا لەگەڵ بوونی ئەو هەمو وەسفە خراپەی بت پەرستان هێشتا ئێوە شەڕیان لەگەڵ دا ناکەن؟! بۆ؟ ئایا ئێوە لەوان دەترسن؟ بەم شێوەیە خوا هەستی موسڵمانان ئەجوڵێنێ‌و ڕایان ئەوەشێنێ‌و دەفەرموێ: ئەوسا هەر ﷲ شایستەیە کە ئێوە لێی بترسن ئەگەر ئێوە باوەڕدارن ، خوا دەفەرموێ:

(١٤) بیانکوژن کە ﷲ سزای ئەوان دەدات بەدەستی ئێوەوسەر شۆڕیان دەکات‌و سەرتان دەخات بەسەریانداو خوا شیفای دڵی باوەڕداران دەدات بەلەناوچونی ئەو بت پەرستو ستەمکارانە.

(١٥) جا ئەو ڕق‌و قینە کەلە دڵتاندابو سەبارەت بەو بت پەرستانە خوا لای ئەبات ، واتە خوا ئەوەندە باوەڕدارانی خۆش ئەوێت ئیشی وایان بۆ دەکات کە دڵیان خۆش بکات‌و هیچ غەم‌و خەفەتێك نەمێنێ لەناو دڵیاندا. ئینجا دەفەرموێ: بەراستی ﷲ تەوبە وەرئەگرێت لەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت وەبەراستی ﷲ زانایە بەقسەکانتان‌و دانایە لە بریارو یاساکانیداو هیچی گۆترەکاری نیە ، ئینجا ﷲ زیاتر سەربازەکانی خۆی فێری خۆگری‌و ئازایی‌و لێ هاتویی دەکات‌و دەفەرموێ:

قَٰتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُّؤْمِنِينَ ﴿١٤﴾ وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ ۗ وَيَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٥﴾ أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تُتْرَكُوا۟ وَلَمَّا يَعْلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ مِنكُمْ وَلَمْ يَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَا رَسُولِهِۦ وَلَا ٱلْمُؤْمِنِينَ وَلِيجَةً ۚ وَٱللَّهُ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٦﴾ مَا كَانَ لِلْمُشْرِكِينَ أَن يَعْمُرُوا۟ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ شَٰهِدِينَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِم بِٱلْكُفْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ وَفِى ٱلنَّارِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّمَا يَعْمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَلَمْ يَخْشَ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ فَعَسَىٰٓ أُو۟لَٰٓئِكَ أَن يَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٨﴾ ۞ أَجَعَلْتُمْ سِقَايَةَ ٱلْحَآجِّ وَعِمَارَةَ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ كَمَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَجَٰهَدَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۚ لَا يَسْتَوُۥنَ عِندَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَهَاجَرُوا۟ وَجَٰهَدُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ أَعْظَمُ دَرَجَةً عِندَ ٱللَّهِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾

(١٦) ئایا ئێوە واگومان دەکەن کە وازتان لێ بهێنرێت هەرکە وتتان موسڵمانین ئیتر هیچ تاقی کردنەوەیەکتان نەبێ؟ لە حاڵێکدا ئەو زانیاریەی کەﷲ هەیەتی سەبارەت بە بەندەکانی لەدنیادا دەرنەکەوێت کە کێ جیهاد دەکات لە ئێوەو کێ بێجگەلە خواو پێغەمبەروﷺ باوەڕداران ناکات بەدۆستی پەنامەکی‌و ناودەرونی بۆخۆی؟ واتە لە دنیادا ئەبێ تاقی بکرێنەوە تا چاك‌و خراپ‌و تێکۆشەرو ترسنۆك ، ڕاست ودووڕو، خواپەرستو هەل پەرست ، ئایین ویستودنیا پەرست لەیەك جیا بکرێنەوەو کە خۆی‌و خەڵك شایەت بن لەسەری بۆ کاتی دادگایی کردنی لەپاشەڕۆژدا ، جا بۆ زیاتر وریاکردنەوەی باوەڕدارانﷲ دەفەرموێ: بەراستی خوا ئاگادارە بەوەی کە ئێوە دەیکەن‌و هیچی لێ ون نابێت بەڵێ خوا ماوە نادات بەهەل پەرستو ترسنۆك‌و دووڕو لە ڕیزی سەربازە ڕاستەقینەکانی ئەودا بمێنێتەوە بەڵکو بەتەنگو چڵەمەو ترس‌و لە دەست دانی خۆشەویستو ماڵ‌و سامان ئەوانە ئەتارێنێ‌و ڕیزی موسڵمانان خاوێن دەکاتەوە ، چونکە خوا نیازی بەکەس نیەو خۆی هەمو ئاڵوگۆڕێك دەکات بەڵام لە دەستی ئەو موسڵمانانەی کە پاك‌و خاوێن‌و خۆیان یەکلاکردوەتەوە بۆﷲ ئەگینا لەراستیدا ﷲ نیازی بەکارو کۆششی ئەوانەش کە پاك‌و خاوێنن نیە. ﷲ دەفەرموێ:

(١٧) بۆ موشریکان‌و بت پەرستان نیە کە مزگەوتەکان ئاوەدان بکەنەوە لەکاتێکا کە خۆیان شایەتبن لەسەرخۆیان کە کافرن واتە

خوا نیازی بەئیشی چاکەی کافرو موشریك نیەو هەرچی چاکەیەك بکەن خوا لێیان وەرناگرێت ، چونکەئەوانە کردەوەکانیان هەڵوەشاوەتەوەو ئەوان بۆ هەمیشە لەناو ئاگردا ئەمێننەوە. بەم شێوە دەرکەوت تا باوەڕی ڕاستەقینە نەبێت کرداری چاکی مرۆڤ لەلای ﷲ هیچ نرخێکی نیەو کافران بۆ هەمیشە لە دۆزەخدان ، ئەمەش دەمکوت کردنێکە بۆ ئەوانەی کە بانگەوازی نزیکبونەوەی ئاییناکان دەکەنو دەیانەوێ وابسەلمێنن بۆ خەڵك کە گاورو جولەکەو خاوەن بیرو ڕاکانی تر وەکو یەکنو هەرکامیان ئیشی باش بکات پاداشتی هەیە؟!

(١٨) لەم ئایەتەدا ﷲ پێنج مەرجی بۆ تەعمیرو ئاوەدان کردنەوەی مزگەوت باس کردوەو دەفەرموێ: هەرئەوکەسە مافی ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکانی هەیە کە باوەڕی بەخوا هێنابێ بەباوەڕێکی ڕاستو دروستو تێکەڵاو بەهاوبەش دانان نەبوبێت بۆ پەروەردگاروباوەڕی هێنابێت بە ڕۆژی دوایی‌و زیندو کردنەوەو نوێژەکانی ڕێكو پێك ئەنجام دابێتو زەکاتی دابێتو نەترسێ لە هیچ کەس بێجگەلە ﷲ ئائەوە ئەو کەسەیە کە شایستەی ئاوەدان کردنەوەی ماڵەکانی خودای هەیە لە ڕاستیدا قورئان هەرجێگایەکی تەماشابکەیت وەك ئاوێنەیەك وایە بۆ مرۆڤ ودەتوانێ بە وردی تەماشای بکاتو بزانێ ئایا خۆی تێدا ئەبینێ یان نە، چ وەسفەباشەکان چ وەسفە خراپەکان بێت.

بۆ نمونە با ئێمەی موسڵمان لێرەدا تەماشای خۆمان بکەینو بزانین ئەو وەسفانەمان تێدایە کە شایستەی ئاوەدانکردنەوەی ماڵەکانی خوداین بەڕاستی مەگەر بەکەمی ئەگینا بیرو باوەڕی ئەمڕۆ لەهاوبەش دانان خاڵی نیەو ئەوەیش کەلێی ناترسین خودایە ، ئەگینا لەهەمو شتێکی تر ئەترسینو ئەگەر چی ئەو سێ وەسفەکەی تر هەبن ، بەڵێ ئەوەی کە خاوەنی ئەو پێنج وەسفە بەنرخەبێ ئەوە باوەڕداری ڕاستەقینەیەو پاشە ڕۆژێکی ڕوناکی هەیە وەك ﷲ دەفەرموێ: ئەوسا نزیکە ئائەوانە لە ڕیزی ئەو کەسانەدابن کە ڕێگای هیدایەتو خۆشبەختی دەگرنەبەر ، بەڵێ ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتەکان بەعیبادەت کردارێکی زۆر بە نرخەوپێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: { إذَا رَأَيْتُمُ الرَّجُلَ يَتَعَاهَدُ الْمَسْجِدَ فَاشْهَدُوا لَهُ بِالإِيمَانِ فَإِنَّ اللهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ ... الآية ﴾./الترمذي وغ ه.صححه الالبا / هەرکاتێ دیتان پیاوێك پەیوەندی چاکە بەمزگەوتەوە جا شایەتی باوەڕداری بۆ بدەن چونکە بێگومان کە ﷲ ی بڵند مەقام دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَعۡمُرُ مَسَٰجِدَ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ ... الآية﴾ .

دیسان بۆ ڕونکردنەوەی تەواوتر باسی ئەوکەسانە دەکات کە باوەڕیان بەپێغەمبەرﷺ نەهێناوە بەلاّم بە ئیشی چاکەوە خەریکبون وەك ئاو ئامادەکردن بۆ حاجیان لە کاتی حەجداو ماڵی خودایان تازە دەکردەوەو بەم دوو وەسفە خۆیان لە ڕیزی خاوەن باوەڕاندا دائەناو ئەیان وت: ئێوە جیهادو کۆچ دەکەن ئێمەش ئەم دووشتە دەکەین جا خوا دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ:

(١٩) ئایا ئێوە ئاودان بەحاجیانو ئاوەدان کردنەوەی "مسجد الحرام" کە ماڵی خودایە وەك ئیشی ئەو کەسە دادەنێن کە باوەڕی هێناوە بەخواو بەڕۆژی دوایی‌و جیهاد دەکات لە ڕێگای خودادا؟ واتە ئایا ئەم دوو تاقمە وەك یەك ئەزانن؟ نەخێر وەك یەك نین لەلای ﷲ. واتەلێرەدا ئەو ڕاستیە دووبارە بوەتەوە کە ئەگەر باوەڕی ڕاستەقینە نەبێ بەخواو بە ڕۆژی دوایی کرداری تری هەرچەند باش بێ لەلای ﷲ هیچ نرخێکی نیە بەڵکو خوا بەو بت پەرستانە دەفەرموێ: جا بەراستی ﷲ دەستی ستەمکاران ناگرێتو نایانگەیەنێت بەخۆشبەختی‌و هەرگیز ڕێنماییان ناکات. ئینجا ﷲ باسی باوەڕدارانی ڕاستەقینە دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٠) ئەوسا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کۆچیان کردوە لەبەر خاتری ﷲوجیهادیان کردوە بەماڵیانو بەگیانیان لە ڕێگای ﷲ دا پلەیان گەورەترە لەکەسانی تر لەلای ﷲ و ئەوانە خۆیان بەختەوەرو خۆشبەختن. سەرەڕای ئەوەش دەفەرموێ:

(٢١) پەروەردگاری خۆیشیان موژدەیان پێ دەدات بە سۆزێکی گەورە لەلایەن خۆیەوەو موژدەیان پێ دەدات بە ڕەزامەندی خۆی‌و چەندین باخچە کەلەناوئەو باخچانەدا بۆئەوان هەیە نیعمەتێکی هەمیشەیی‌و ڕۆژێك لە ڕۆژان کۆتایی نایەت،

(٢٢) لەو جێگادا دەمێننەوە بەهەمیشەیی ، نەنیعمەت دوای دێو نەئەوان دێنەدەر، بێگومان لەلای ﷲ پاداشتی گەورە هەیە بۆ تێکۆشەرانی ڕێگای ﷲ جا ئیتر چۆن ئەمانە لەگەڵ بێ باوەڕانێکدا کەئەگەر کەمێ کاری چاکیش بکەن خوا وەری ناگرێ‌و جێگایان دۆزەخە وەکو یەکەن؟! واجارێکی تر خوا پەیڕەوانی ئایینەکەی خۆی تەمێ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٣) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە باوکتانو براکانتان نەکەن بەدۆستو سەرپەرشتیاری خۆتان ئەگەر کوفریان پێ خۆشبو تا باوەڕهێنان، جا هەر کەسێك لە ئێوە ئەوکەسانە بکات بە سەرپەرشتو دۆستی خۆی ئەوسا ئەوانە خۆیان ستەمکارنو بەدەستی خۆیان خۆیان دوچاری سزای پاشە ڕۆژ دەکەن ، واتە

يُبَشِّرُهُمْ رَبُّهُم بِرَحْمَةٍ مِّنْهُ وَرِضْوَٰنٍ وَجَنَّٰتٍ لَّهُمْ فِيهَا نَعِيمٌ مُّقِيمٌ ﴿٢١﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥٓ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٢٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوٓا۟ ءَابَآءَكُمْ وَإِخْوَٰنَكُمْ أَوْلِيَآءَ إِنِ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْكُفْرَ عَلَى ٱلْإِيمَٰنِۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٤﴾ لَقَدْ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ فِى مَوَاطِنَ كَثِيرَةٍۙ وَيَوْمَ حُنَيْنٍۙ إِذْ أَعْجَبَتْكُمْ كَثْرَتُكُمْ فَلَمْ تُغْنِ عَنكُمْ شَيْـًٔا وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ ٱلْأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَأَنزَلَ جُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا وَعَذَّبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٦﴾

ئەو خزمایەتیە کە چەند ڕێزی لێ گیراوە لە ئایین دا ئەگەر هاتو بەهۆی بیرو باوەڕەوە لەیەك جیابونەوە هیچ نرخێکی نامێنێو مرۆڤەچاکەکەیش بەهۆی دۆستایەتی خراپەکەوە دوچاری سزا دەبێت ، ئینجا زیاتر ئەو مەبەستە ڕۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿٢٤﴾ ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئەگەر باوکانتانو کوڕەکانتانو براکانتانو ژنانی هاوسەرتانو خێڵەکانتانو ئەو ماڵەی کەبەدەستان هێناوەو کۆتان کردوەتەوەو ئەو بازرگانیەی کەئەترسن زیانی تێدا بکەنو ئەوخانوبەرەیەی کەدڵتان پێی خۆشەو پێی ڕازین ، ئەگەر ئائەمانەتان لە خواو لە پێغەمبەرەکەیﷺ ولە جیهاد لە ڕێگای ئەودا لەلا خۆشەویستربو جا بە وانە بڵێ: با چاوەڕێ بکەن هەتا فەرمانی خوایان بۆ دێ بۆ تۆڵە سەندن لێیان، بەڕاستی ئەمانە لە سنوری ئایین تێپەڕیونو خوایش گەلی فاسقو لە سنور دەرچو ناخاتە ناو نیعمەتی خۆیەوەو ڕێنمایی ناکات ، پاش ئەوەی کەلۆمەی ئەو کەسانەی کرد کەبەهۆی خۆشەویستنو خزمایەتی یان خڕکردنەوەی سەروەتو سامان یان لە دەست نەدانی جێگاو ڕێگای خۆش وازلە خۆشەویستی خواو پێغەمبەروﷺ جیهادی ڕێگای خوا ئەهێنن سرنجی موسڵمانان ڕادەکێشێ بۆلای سەرچاوەی سەرکەوتنو دەفەرموێ:

﴿٢٥﴾ بەڕاستی ئێمە لە زۆر شوێنا یارمەتی ئێوەمان داو سەرمان خستن وەك جەنگی بەدر، وە لە ڕۆژی حونەیندا کاتێك کەئێوە بە خۆتاندا نازیو لە زۆری خۆتان سەرتان سوڕماو پێتان وابو کەسەرکەوتن بەدەس خۆتانە کەچی کاتێ ڕوبەڕوبونەوە لەگەڵ دوژمندا هەر زۆر زوو پەرتەوازەبوون، جا ئەو زۆرییەی خۆتان سودی پێ نەدانو لەگەڵ ئەو زۆرییەدا وا ورەتان لەدەستدا کە زەویتان لێ تەنگبو پاشان پشتتان تێکردو جەنگەتان چۆڵکرد.

﴿٢٦﴾ پاشان خوای میهرەبان ئارامی نارد بۆ پێغەمبەرکەیو بۆ باوەڕدارانو سەربازانێکی نارد کە ئێوە نەتان دەبینینو سزای ئەوانەی دا کە کافربونو شکاندنیو سەروەتو سامانیان کەوتە دەست باوەڕداران، ئا ئەوە تۆڵەی کافرانە واتە کافران هەرگیز پیرۆز نابن ئەگەرچی بۆ چەند ساتێکیش سەرکەوتن بەدەست بهێنن چونکە بڕیاری خوا لەسەر شکستیو لە ناوچوونی کافرو بێ باوەڕانە هەرچەند بەهێزو پڕ چەكو چۆڵەبن وەك لە سورەتی "ئەنفال" دافەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ لِيَصُدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَسَيُنفِقُونَهَا ثُمَّ تَكُونُ عَلَيْهِمْ حَسْرَةً ثُمَّ يُغْلَبُونَۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِلَىٰ جَهَنَّمَ يُحْشَرُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾الأنفال: ٣٦

جا بۆزیاتر ڕۆشنبونەوەی ئەم چەند ئایەتە بفەرمون لەگەڵ ئەم ڕوداوەدا، جەنگی بەدر لە سورەتی "ئەنفال" دا باسکراو تێ گەیشتین کە هەرچەند ژمارەی موسڵمانان لە سێ سەدو پانزە کەس زیاتر نەبو بەڵام ژمارەی کافران لە نۆسەد کەس زیاتر بون جاچونکە موسڵمانان هیچ هیوایەکیان بەسەرکەوتن نەبو ئەگەر خوا هێزی خۆی نەخاتە کارەوە بۆیانو بەو باوەڕەوە لە بەرانبەر ئەوژمارە زۆرەدا وەستانو سەرەنجام خوای زاناو توانا سەری خستن بەڵام لە غەزای حونەیندا بۆماوەیەکی کەم لەبەر زۆری خۆیان ئەو سەرچاوەیان لەبیر چویەوە کە ئەو لەبیر چونەوە بوبە هۆی شکانو ڕاکردنی موسڵمانانو نزیکەی هەزار کەس لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ مایەوە ، ڕووداوەکە ئابەم شێوەیەبو: کاتێ کە فەتحی مەکە کرا پێغەمبەرﷺ هەمویانی بەخشیو هەواڵ بە پێغەمبەرﷺ گەیشت کە هەزاران کەس کۆبونەتەوە بۆ ئەوەی شەڕی لەگەڵدا بکەن ، پاشاکەیان کە مالیکی کوڕی عەوفی نەزریو لەگەڵ تەواوی سەقیف داو کوڕانی جەشەمو کوڕانی سەعدی کوڕی بەکرو چەند تیرەیەکی کەم لە کوڕانی هیلالو چەند پیاوێك لە کوڕانی عەمری کوڕی عامیرو عەوفی کوڕی عامیر بەخۆیانو ژنو مەڕو ماڵاتیانەوە بەجرنەو پڕنەوە هاتون بەرەولای پێغەمبەرﷺ پێغەمبەریشﷺ بەو دەهەزار سەربازەی کە هێنابوی بۆ سەرمەکەو دوهەزار شەڕکەری مەکەیشی پێوە لکابو ببون بە دوانزەهەزارو بەرەو ڕویان ڕۆیشتو لە شیوێك دا کە ناوی "حونەین" بو لە تاریکی بەیانیدا هەڵتەقین بەیەکدا کەئەوان

ثُمَّ يَتُوبُ ٱللَّهُ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَاۚ وَإِنۡ خِفۡتُمۡ عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٨﴾ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٢٩﴾ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِۖ ذَٰلِكَ قَوۡلُهُم بِأَفۡوَٰهِهِمۡۖ يُضَٰهِـُٔونَ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَبۡلُۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٣٠﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٣١﴾

کەمینیان کردبو موسڵمانەکانیش بێ ئاگابون ، موسڵمانانیان دایەبەر تیرو شیری روت کراو بەفەرمانی پاشاکەیان هەمویان وەك یەك کەس هێرشیان کردە سەر موسڵمانان ، لەم کاتەدا وەکو قورئان دەفەرموێ:(پشتیان تێ کردو هەڵ هاتن) و پێغەمبەر ﷺ لەو ڕۆژەدا کەسواری ئێسترێکی خۆی بو کەناوی (شەهباو)بو لەمەیدان دا مایەوەو ئێسترەکەی بەرەو ناوجەرگەی دوژمن لێ ئەخوڕیو عەباسی مامی ئاوزەنگی لای راستی گرتبو ئەبو سوفیانی کوڕ ی حارسی کوڕی عەبدولوتەلیبی ئامۆزای لای چەپی گرتبو باری ئێسترەکەیان گران ئەکرد تازۆر توند نەچێت بەلام پێغەمبەرمانﷺ ناوی خوای ئەبردو ئەی فەرمو (بۆلای من بێن ئەی بەندەکانی خودا ، بۆلای من بێن ، من پێغەمبەری خودام، هەرلەو کاتەدا ئەیفەرمو:{من پێغەمبەرمو هیچ درۆی تێدانیە من کوڕی عەبدولوتەلیبم} بەڵێ خۆیو نزیکەی سەد کەسێك لە یارانی لەوێدا مانەوە کە ئەبوبکرو عومەرو عەباسو فەزلی کوڕ یو عەلیو ئەبو سوفیانی کوڕ ی حاریسو ئەیمەنی کوڕی ئوموو ئەیمەنو ئوسامەی کوڕ ی زەید خودا لەهەمویان رازی بێت لەوانەبون پاشان پێغەمبەرﷺ فەرمانی کرد کەعەباسی مامی کەدەنگێکی گەورەی هەبو بانگ بکاتە موسڵمانان بۆگەڕانەوەو بلێ: ئەی یارەکانی درەختەکە ـ مەبەست ئەو درەختەبو کە موسڵمانانی کۆچەریو یاریدەدەرەکان لە سێبەریدا پەیمانیان دا بەپێغەمبەرﷺ کە دەوری چۆڵ نەکەنو رانەکەن ـ ئەوەیش بەو ناوەوە بانگی کردنو هەندێ جار ئەیوت: ئەی ڕەفیقەکانی سورەتی "بەقەرە" موسڵمانانیش کاتێ کەئەو بانگ کردنەیان بیست وتیان: بەڵێ واوەلامان دایتەوەو خەڵکەکە بەرەولای پێغەمبەرﷺ گەڕانەوە تەنانەت کەسێ ئەگەر وشترەکەی پەکی بکەوتایە وشترەکەی بەجێ دەهێشتو زرێکەی دەپۆشیو بەپەلە دەهاتەوە لای پێغەمبەرﷺ جا کاتێ هەندێك لەدەوروبەری کۆبونەوە فەرمانی پێ کردن کە هێرش بکەنە سەرکافرەکان، زۆری نەبرد کافرەکان شکانو موسڵمانان دوایان کەوتنو هێشتا هەندێ لە موسڵمانان نەگەشتبونەوە بەپێغەمبەرﷺ کۆمەڵێ گیراو کۆکرابوونەوە لەبەردەم پێغەمبەرﷺ دا. ئەمە بەکورتی ئەو جەنگەبو کە موسڵمانان خۆیانیان بەلاوە زۆربو وایان دەزانی نابێ شکست بخۆنو بۆ کاتێکی کەم سەرچاوەی یارمەتیو سەرکەوتنیان لەبیر چویەوە بەو شێوەیە لە ئەوەڵەوە شکان بەلام پاشان بەو کۆمەڵەکەمە ﷲ سەری خستنەوە بەسەرکافران دا بۆیە فەرموی: (ئەو کۆمەڵە زۆرەی ئێوە هیچ سودی پێ نەدان) بەلام کاتێ کە هەستیان بەهەڵەی خۆیان کردو بەرەولای پێغەمبەرﷺ گەڕانەوە ، خوای میهرەبان بەزەیی بەواندا هاتەوەو تەوبەی لێ وەرگرتنو دوژمنانی شکاندنو ئەوانی سەرخست ، دەی ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە کەئێمەیش بەراستی بەرەوپێغەمبەر ﷺ بگەڕێینەوە تا بەلکو ﷲ بەهاوارمانەوە بێتو لەم بارو دۆخە ئاڵۆزو تاریکەدارزگارمان بکات؟

(٢٧) پاش ئەم بەخۆ نازینوراکردنەداو دووبارە گەڕانەوەی باوەڕداران بۆلای پێغەمبەر ﷺ خوا تەوبە وەرئەگرێت لەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێ ئەوەبو زیاتر لە بیست رۆژی پێ نەچوخەڵکی هەوازن هاتنو موسڵمان بونو پێغەمبەر کردنی بەسەر پشك لەبارەی ئازاد کردنی گیراوەکانیان یان ماڵەکانیان ، ئەوانیش گیراوەکانیان هەڵبژارد کە نزیکەی شەش هەزار پیاوو ئافرەتو مناڵ بونو سامانەکانیانی دابەشکرد بە سەر شەڕکەرانو بەشی پاشاکەیانیشی داو کردیەوەبە سەرپەرشتیان. خۆ ﷲ زۆر لێ خۆشبو بەبەزەییە بۆ بەندەکانیو هەرکاتێ بەباشی بگەڕێنەوە لە تاوانو خراپەکاری خوا لێیان خۆش دەبێت ، جابەم شێوەیە کە سەرکەوتنو ژێرکەوتن بەدەستﷲ یەو چەندە راستو دڵسۆزبن لەسەر ئایینو پەرهیزکارو خۆ پارێزبن لەتاوان ئەوەندە زوتر خوا بەدەمیانەوەدێت بۆیە عومەری کوڕ ی خەتاب خوا لێی رازی بێت زۆر جار بەسەرپەرشتی هێزەکانی ئەوت: خۆتان لە تاوان بپارێزن تا خوا یارمەتیتان بدات، ئەگەر ئێوە تاوانتان کرد هەرگیز سەرناکەون چونکە ژمارەو چەکوو چۆڵی دوژمن لە ئێوە زیاترە بە پەرهێزگاری ئێوەو تاوانی ئەوان خوا ئێوە سەر دەخات. ئینجا فەرمان دەدات بەسەر موسڵمانان دا

کەماوە بە موشریکان نەدەن لەمڕۆ بەدواوە بەو شێوە ناشرینە بێنە ماڵی خوداوەو دەفەرموێ:

(٢٨) ئەی ئەو کەسانەی کەباوەڕتان هێناوە بەراستی بزانن کەبت پەرستان بەهۆی بیرو باوەڕیانەوە پیسن دەی با پاش ئەمساڵیان نزیکی "بەیت" نەکەونەوە ئاشکرایە هاتنی خەڵکی زۆر بۆ مەکە سودێکی ئابوری هەبو بۆیە خوا فەرموی: ئەگەر ئێوە ئەترسن لە فەقیری؟ مەترسن بەم زوانە خوا ئێوە بێ نیاز دەکات بەهۆی بەرەکەتو لوتفی خۆیەوە. ئاشکرایە لەو کاتەوە ئیتر خەڵکی مەکە ئەوەندە فەرو نیعمەتی خوا ڕژابەسەریاندا فەقیریان لەبیر نەما ئەوەتە ئێستایش کە حاکمیەتی خودا نەماوە هێشتا ساڵانە ئەوەندە خەڵك ئەچێت بۆ حەج، وڵاتی سعودیە ناچار بوە کە ساڵانە بێجگەلە ژمارەیەکی دیاری کراو ماوەنەدات بەکەسی تر بچێت بۆحەج. واتە بەراستی، راستو ڕەوان هاتەدی مانای ﴿فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ﴾ التوبة: ٢٨ "فلله الحمد" خوا ئارەزۆی لێ بوەو نیعمەتێکی بێ سنوری ڕژاندوە بەسەریاندا ، جا زۆر جێگای خۆیەتی کۆتایی ئایەتەکە بەم شێوە بێ کە بێگومان ﷲ زانایە بەقسەکانتانو ئیشەکانی خودایش بەحیکمەتوبەجێیە، جارێکی تر خوا رولە موسڵمانان دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٩) غەزابکەن دژی ئەوانەی کە باوەڕیان نیە بەخواو بەرۆژی دوایی‌و بەقەدەغەو حەرامی نازانن ئەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەیﷺ قەدەغەو حەرامیان کردوە وەتەسلیمی ئایینی راستەقینە کە ئایینی ئیسلامە نابن، ئەوانە کێن‌ولەکام بەشن؟ ئەوانە لەوکەسانەن کە پەڕاویان پێ دراوە واتە: گاورو جولەکە، ئەبێ موسڵمانان لەگەڵ ئەمانەدا شەڕبکەن تا ئەوان سەرانە ئەدەن بەهۆی هێزی موسڵمانانەوەو ئەوان زەبونو کەم دەست ئەبن واتە پێویستە موسڵمانان لەگەڵ ئەواندا بجەنگن تالە دەست ئەخرێن‌و ئامادەی سەرانە ئەبن ، وەنابێ هەستی هێزو دەسەڵات بکەن بەداخەوە هەرلەم کاتەدا فرۆکەکانی گاورو جولەکە بەسەر خاکی ئیسلامداو لەسەر پارەی موسڵمانان ئەخولێنەوە؟! ئەمە لە کوێ‌و ئەو فەرمودەی خوا لە کوێ؟!

پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:{لَا تَبْدَءُوا الْيَهُودَ وَالنصَارَى بِالسلَامِ وَإِذَا لَقِيتُمْ أَحَدَهُمْ فِي الطريقِ فَاضْطَروهُمْ إِلَى أَضْيَقِهِ /رواه مسلم/

پێشەکی ئێوە سەلام لە گاورو جولەکە نەکەن، وە هەرکاتێك لە ڕێگادا بەیەکێك لەوان گەیشتن ناچاری بکەن بالەکام لاوە تەنگە لەوێوە بڕوات} ئینجا خوا باسی سیفەتێکی تری خراپی گاورو جولەکە دەکات تا موسڵمانان زیاتر سوربن لەسەر جیهاد دژی ئەو تاقمە غەزەب لێگیراوو گومڕا هانەو دەفەرموێ:

(٣٠) جولەکە دەڵێن: عوزەیر کوڕی خودایەو گاورەکانیش لەوان سەرلێ شێواوترن چونکە ئەوانیش هەندێکیان عیسا بەکوڕ ی خودا دەزانن‌و هەندێکی تریان عیسا بە خوای سێهەم دەزانن کە لێرەدا باسی تاقمی یەکەمیان دەکاتو دەفەرموێ: خۆگاورەکان ئەیان وت: کەعیسا کوڕ ی خودایە کە ئەوە قسەیەکەو بەدەمیاندا دەهاتو خۆیشیان دەیان زانی کە وانیە، جا قسەی ئەو دوو تاقمە وەك قسەی ئەو کافرانەی پێش خۆیان بو، واتە ئەمانە لەسەرئەم بیروڕای خۆیانە هیچ بەڵگەیەکیان نەبو تەنها شتێکی سەرزارەکی بوەو هیچی تر، ئینجا ﷲ بێزاری خۆی لێیان دەردەبڕێ‌و دەفەرموێ: نەفرینی خوایان لێ بێ‌و خوا لەناویان بات چۆن وابەناڕەوا ئەو درۆو دەلەسانە دروست دەکەن؟! هەندێ لەتەفسیر نوسان دەڵێن: کاتێ کە عەمالیقەکان زاڵبون بەسەر جولەکەکاندا، زاناکانیان کوشتن‌و گەورەکانیان لە سێدارەداو عوزەیرمایەوەو هەمیشە بۆ کوڕ انی یعقوبو بۆ لە ناو چونی زاناکانیان دەگریا تا پێڵوەکانی هەردوو چاوی کەوتن ، هەر بەم شێوەیە بوو تا بەناو گۆڕستانێکدا تێپەڕی‌و دی ئافرەتێك بەسەر گۆڕێکەوە دەگری ئەڵێ: وای بۆ وەلی نیعمەتەکەم وای بۆ پۆشتەکەرەوەکەم، عوزەیر پێی وت: هاوار بۆ تۆ کێ پێش ئەوە بژێوی بەتۆ ئەدا؟ ئافرەتەکە وتی: ﷲ، ئەویش وتی: دەی خۆ ﷲ زیندوەو نامرێت، ئافرەتەکە لە وەڵامی عوزەیردا وتی: ئەی عوزەیر کێ خەڵکی فێری زانیاری دەکرد پێش زانایانی نەوەی یەعقوب؟ ئەویش وتی ﷲ، وتی دەی بۆ دەگریت بۆیان، عوزەیر زانی ئەوەشتێکەو بۆ ئاموژگاری ئەودانراوە ، لە پاشان پێی وترا بڕۆ بۆ فلان جۆگە خۆتی لێ بشۆرەو لەوێدا دوو ڕکات نوێژ بکە دڵنیابە لەوێدا بە پیاوێك دەگەیت هەرچی پێدایت بیخۆ، ئەویش چوە ئەوجێگایەی کەپێی وترا ئینجا دی پیاوێك لەوێ یەو بەعوزەیری وت: دەمت بکەرەوە ، ئەویش دەمی کردوە ، جا شتێك کەوەك پشکۆ ئاگرێکی گەورەبو فڕەیدایە ناو دەمیەوەو ئەو ئیشەی سێ جار پێ ئەنجامدرا، ئیتر عوزەیر گەڕایەوەو بو بە زاناترین کەس لەبارەی تەوراتەوە جا بەوانەی کەمابونەوە لەنەوەی یەعقوبی وت: ئەی کوڕ انی یەعقوب من تەوراتم بۆ هێناونەوە وتیان: ئەی عوزەیر تۆ درۆزن نەبویت، ئینجا چو قەڵەمێکی هێناو بەستی بەپەنجەیەکیەوەو تەوراتی بەپەنجەی خۆی بۆ نوسین ئیتر خەڵکەکە کەم کەم گەڕانەوەو زاناکانیان ئەوانەی کە مابوون‌وخۆیان شاردبویەوە هاتنەوەو هەواڵی عوزەیریان پێدرا ، ئەوانیش ئەو وێنانەی تەورات کەلە چیاکاندا شاردبونیانەوە هێنایانەوەو دییان ئەوەی کە عوزەیر نوسیوێتی راستە، ئینجا هەندێ لە نەزانەکانیان وتیان: بۆیە عوزەیر توانیوێتی شتی وا بکات چونکە کوڕی خودایە!! هەروەها خوای

يُرِيدُونَ أَن يُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَيَأۡبَى ٱللَّهُ إِلَّآ أَن يُتِمَّ نُورَهُۥ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٣٢﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ ﴿٣٣﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡأَحۡبَارِ وَٱلرُّهۡبَانِ لَيَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡبَٰطِلِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۗ وَٱلَّذِينَ يَكۡنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلۡفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يُحۡمَىٰ عَلَيۡهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكۡوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمۡ وَجُنُوبُهُمۡ وَظُهُورُهُمۡۖ هَٰذَا مَا كَنَزۡتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡ فَذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡنِزُونَ ﴿٣٥﴾ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثۡنَا عَشَرَ شَهۡرٗا فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوۡمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ مِنۡهَآ أَرۡبَعَةٌ حُرُمٞۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُۚ فَلَا تَظۡلِمُواْ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمۡۚ وَقَٰتِلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ كَآفَّةٗ كَمَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ كَآفَّةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٦﴾

زاناو دانا هۆیەکی تر لە خراپیو کوفری جولەکەو گاور باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٣١﴾ ئەمانە زاناو عابیدەکانی خۆیانیان کردوە بە خوای خۆیانو وازیان لە بەندایەتی خوا هێناوەو پەیڕەوی ئەوان دەکەن لە حەرامو حەلاڵ کردندا هەرچی ئەوان حەلاڵی بکەن حەلاڵەو هەرچی ئەوان حەرامی بکەن حەرامە، ئەمەش تەنها بەدەست خودایەو کەس بۆی نیە شتی وابکات، ئەوسا هەرکەس ئاوای کرد ئیدعای خوایەتی دەکات چ بلێ یا نەلێ. ئینجا دەفەرموێ: خۆ مەسیحی کوڕ ی مەریەم یان کردوە بە خوای خۆیان وئەوان فەرمانیان پێ نەکراوە بێجگەلەوەی کە ئەبێ بەندایەتی یەك خودا بکەنو هیچی تر، کە ئەو خودایەش پەرستراوێکی راستەقینەیەوهیچ پەرستراوێکی راستەقینەی تر نیە بێجگە لەو پاكو بێ عەیبەو بێ نیازە لەهەمو شتو هەمو شتێك نیازی بەو هەیەو دوورە لەو شتانەی کە جولەکەو گاورو باقی بێباوەڕو بت پەرستانی تر دایدەنێن بۆی ، ئەڵێن: کاتێ عەدی کوڕی حاتەمی تائی هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و خاچێکی زیوی لەملدا بو کە پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە حاتەم وتی: ئێمە ئەوانمان نەکردوە بە خوای خۆمان، پێغەمبەرﷺ فەرموی:{بلى إنهم حرموا عليهم الحلال وأحلوا لهم الحرام فاتبعوهم فذلك عبادتهم إياهم/الترمذى، حسنه الالبا : / بەڵێ کردویانن بەخوای خۆیان چونکە ئەوان حەلاڵیان لێ حەرام کردون وحەرامیان بۆ حەلاڵ کردونو جائەوانیش پەیڕەوییان کردون ئائەوە بەندایەتی ئەو خەڵکەیە بۆ ئەوان، جا بائەوانەی کەیاسا بۆ خەڵك دائەنێن بێجگەلە یاساکەی خوا تەماشای خۆیان بکەنو بزانن ئایا بەگوێرەی ئەم ئایەتەو ئەم فەرمودە راستەی پێغەمبەرمانﷺ خۆیان نەکردوە بەخوای خەڵك؟ وەئەو خەڵکەش نەبوون بەبەندەو عیبادەت کەری ئەوان؟ لەخوابترسن ئەی خاوەن باوەڕان قیامەتو حیساب هەیەو وریابن لەگەل زاتێکی بە هێزدا زۆران بازی دەکەن هەرگیز نایبەنەوە!! تەماشابکەن ئەوە بڕیاری خواو فەرمودەی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ ، قسەی من نیە. ئینجا الله دەفەرموێ:

﴿٣٢﴾ ئەمانە ئەیانەوێ نوری خوا کە ئیسلامە بەفوی دەمیان بکوژێننەوە، بەڵێ ئەم ئایینە لە رووناکی رۆژ بەسودترو روناکترەو خۆگەیەنەرە بەدڵەکانو کەس ناتوانێت رێگای گەیشتنی بۆ هەمیشە بگرێت هەرچی لەگەڵدا بکرێو هەرچۆن دژایەتی بکرێت سەرئەنجام بەگوێو دڵەکان ئەگاتو خەڵك لەسەر چاوڕۆشنی ئەژیو ئەمرێت مەگەر بەدەگمەن، وەکەسیش بەهانەی نامێنێ بۆ رۆژی دوایی، چونکە الله خاوەنیەتیو ماوەنادات بەهیچ کەسو دەسەڵاتێك کە بتوانێ رێگای ئەو نورەی بگرێتو نوری خۆی تەواو دەکات ، وەهەر ئەبێ وابێ ئەگەر چی کافرانیش پێیان ناخۆش بێ چونکە

﴿٣٣﴾ ئەوزاتە هەرخۆیەتی کە پێغەمبەری خۆی ناردوە بەرێنمایی و چاوڕۆشنیوئایینو بەرنامەی راستەوە تا سەری بخات بەسەر تەواوی ئاینەکاندا، وەئەبێ وابێ ئەگەر چی موشریکان پێیان ناخۆش بێ . ئەمە موژدەیەکی زۆر خۆشە بۆ باوەڕدارانی راستەقینە چونکە قسەی خوایەو ئەبێ بێتەدی هەرچەندە کافرانو موشریکان پێیان ناخۆش بێت هەروەکو لە فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ دا هاتوە، کەخوا ئەو ئایینە ئەگەیەنێ بەهەمو زەویو هیچ ماڵێك نابێ چ لە قوڕو بەرد یان لە دەوارو چادر بێ مەگەر ئەم ئایینەی پێ بگات واتە کەس نیە ئەو ئایینەی پێ نەگات یان بەهۆی دەسەڵاتو زاڵبونی موسڵمانان بەسەر تەواوی ناوچەکاندا یان یەك کەوتنو داماو بونی بێ باوەڕانو تەسلیم بونیان بەموسڵمانان تاموسڵمان هەبێت لەم سەر زەوییەدا، وەك پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: { لا يذهب الليل والنهار حتى تُعبد اللات والعزى فقلتُ يا رسول الله إن كنتُ لأظن حـ ـ أنزل الله هو الذي أرسل رسوله بالهدى ودين الحق ليظهره على الدين كله ولو كره المشركون أن ذلك تاما قال إنه سيكون من ذلك ما شاء الله ثم يبعث الله ر ـا طيبة فتوفى كل من في قلبه مثقال حبة خردل من إ ان فيبقى من لا خير فيه فيرجعون إلى دين آبائهم / رواه مسلم/دنیا تەواو نابێت تا "لات"و "عوزا"نەپەرسترێت جا وتم ئەی پێغەمبەری

خوایﷺ بەراستی من کاتێ کەخوا ئەم ئایەتەی رەوانە کرد(**هُوَ الَّذِي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بِالْهُدَى وَدِينِ الْحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلَى الدِّينِ كُلِّهِ وَلَوْ كَرِهَ الْمُشْرِكُونَ**)

وام دەزانی کە ئیتر هەروادەبێ فەرموی: بەراستی هەروادەبێ تائەوکاتەی کە خوا ئارەزوی لێیەتی پاشان خوا بایەکی پاك دەنێرێ ئەوسا بەو بایە ئەمرێت ئەوەی کە بەئەندازەی تۆیی خەردارەیەك ئیمان لەناودڵیدایە ئەوسا ئەوکەسە دەمێنێتەوە کە هیچ سودێکی تێدانامێنێ جا ئەگەرێنەوە سەردینی باوباپیرانیان }

ئینجا خوای زاناو دانا موسڵمانان ئەترسێنێ لە زاناو عیبادەتکەرانی خراپو زاناو عابیدەکانی پێش ئەم گەلەمان بۆباس ئەکات تا ئێمەیش زاناو عابیدی راستو ناراست بناسینو یەکەممان خۆش بوێو پەیڕەوی بکەینو لە دووهەمیان خۆبپارێزینو لێیان دور بکەوینەوەو دەفەرموێ:

(٣٤) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە چاك بزانن کە زۆربەی هەرە زۆری زانایانو پەرستشکاران لەجولەکەوگاور بەراستی بەناڕەوایی ماڵی خەڵك دەخۆنو رێگا لەدینی ﷲ دەگرنو ماوەنادەن بەخەڵك تابە وردی تەماشای بکەنو راستیەکانی بزانن. ئەم ئایەتە پێشەکی لۆمەی زاناو عابیدەکانی جولەکەو فەلەکان دەکات کەبەوشێوەیە رەفتاریان کردوە ، ئاشکرایە هۆی دابەزین، ئایەت تایبەت ناکات بەڵکو گشتیەو بۆ هەرزاناو بەندایەتی کەرێکە کە ماڵی خەڵك بەناڕەوا بخواتو راستیەکان لە خەڵك بشارێتەوەو لۆمەو سەرزەنشتی ئەو کەسانە بکەن کە راستی بەخەڵك دەگەیەننو حەقیقەت بۆ خەڵك رۆشن دەکەنەوە ، بەداخەوە ئەمڕۆ زۆرێك لەو کەسانەی کە پۆشاکی بەناو زانایان پۆشیوەو ئەوانەی کە بەناو دینەوە رێزیان لێ ئەگیرێو بەناو ئایینەوە ئەخۆن لەجیاتی خزمەتی ئایینو رێ رونکردنەوەو دەست گرتنی نەزانو هێنانیان بۆسەر ئایینی ﷲ دژایەتی ئەو تازە پێگەیشتوانە دەکەنو بەدەیان ناوو ناتۆرەی ناڕێکیان پێوە دەنێن تا لەبەرچاوی خەڵکی ناشیرینیان بکەنو ئەوانیش توشی ئازاربن بەداخەوە ئەنجامدەرانی سونەتێکی پێغەمبەرمانﷺ کەلە ناو خەڵکا نەماوە لەباتی تەشویق، دەیان بەناو زانا ئەوکارە بەناشیرینو خیلافی مەزهەبو سەرلێ شێوانی خەڵكو..و..هتد ناوئەبەنو ئەبنە هۆی تاراندنو تۆراندنی سەدان لاوی تازە پێگەیشتو تەنانەت ماوەشیان پێنادەن لە مزگەوتەکانیاندا دانیشنو خەریکی لەبەرکردنی قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەرمانﷺ ببن؟!! بەڵام لەبارەی ئەو هەمو بەرەڵاو قومارکردنو عەرەق خواردنو خراپانەوە بێ دەنگن؟! ئینجا خوا هەڕەشەی توند لەو کەسانە دەکات کەهەر خەریکی

کۆکردنەوەی ماڵنو زەکاتی لێ نادەنو دەفەرموێ: ئەوسا ئەو کەسانەی کە ئاڵتونو زیو کۆدەکەنەوەو نایبەخشن لەپێناویﷲ دا ئەی محمدﷺ موژدەیان پێ بدە بە سزایەکی دەردناك، ئاشکرایە بەکارهێنانی موژدە بۆ سزا گاڵتە پێ کردنە ، بەراستی ئەوانەی کە وادەزانن دنیا واتە سەروەتو سامانو کۆشكو تەلاری بەرزو لە بیری ئایندەی خۆیاندا نینو نازانن بۆچی هاتوون بۆ ئەم ژیانە لەهەڵەیەکی زۆر گەورەدان ، ئەوانە سزای سەختیان بۆدانراوە، کەی؟

(٣٥) لەو رۆژەدا کە ئەوسەروەتو سامانە ئەکرێ بەپارچەی ئاسنو بۆی داخ دەکرێت لەناو ئاگری دۆزەخدا جا ئەوکاتە ناوچاوانیان پێ داخ ئەکرێت چونکە لە دنیادا چاوی بەرز گرتووەو تەماشایی ئایینو مافی خەڵکی نەکردوە ، هەروەها بەو ئاسنەداخە، تەنیشتەکانیان داخ دەکرێت، چونکە لایان دەکردە بێ نەواو خاوەن مافان لە دنیادا، هەروەها بەو ئاسنەداخە پشتەکانیان داخ دەکرێت چونکە پشتیان کردوەتە بێ نەواو نیازمەندانو خاوەن مافان، وەئەم داخ کردنەیش لە رۆژێکدا دەبێ بەئەندازەی پەنجا هەزار ساڵی ئەم دنیایەو هەرکاتێ سارد ئەبێتەوە دیسان بۆی داخ دەکرێتەوەو پێیان دەوترێت: ئائەمەیە کە کۆتان کردوەتەوە بۆ خۆتانو واتان دەزانی بەوە بەختەوەر ئەبن دەی بچەژن تۆڵەی ئەو کۆکردنەوەو عەمبار کردنەتان کەدڵتان نەدەهات لەرێگەی خوادا خەرجی بکەن. پاش ئەوەی کە باسی زاناو عابیدەکانی پێشوو رەفتارەکانی کردنو تێی گەیاندین کە کۆکردنەوەی سەروەتو سامانو زەکات نەدانی ئەو سزا سەختەی هەیە، دەسکاری نەفامەکان بۆگۆڕانی یاساکانی ﷲ باس دەکات ودەفەرموێ:

(٣٦) بەراستی ژمارەی مانگەکان لەلای ﷲ دوازدە مانگە ، ئەو دوازدە مانگەش تۆمار کراوەو ناگۆڕێ لەو رۆژەوە کە خوا ئاسمانانو زەوی دروست کردوەو لەو دوازدە مانگەش چواریان شەڕتێدا کردنی قەدەغەیە کە بریتین لە (**ذوالقعدة، ذوا جة، رم**) کەبەدوای یەکدانو مانگی (**رجب**) یش کەوا ئەکەوێتە نێوان (جمادالاخرە)و (شعبان)ەوە نابێ لەو چوار مانگەدا شەڕبکرێت مەگەر دوژمنان دەسدرێژی بکەنە سەر موسڵمانان لەومانگانەدا ، ئینجا ئەفەرموێ ئائەوەیە بەرنامەی ئایینی راستەقینەو بەنرخ جا لەو ماوەیەدا زوڵم لە خۆتان نەکەن واتە نەکەن لەو چوارمانگە قەدەغەکراوەدا شەڕبکەن، چونکە پێشەکی زیانی بۆخۆتان هەیە کەبەرنامەی خواتان شکاندوە، لە راستیدا ستەم لەهەمو کاتێکدا خراپە بەڵام لەم کاتانەدا گەورەتر ئەبێ هەرچۆنێك تاوان خراپە بەڵام لە کەعبەدا بکرێت تاوانەکەی

إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَـٰلِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٧﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَا لَكُمْ إِذَا قِيلَ لَكُمُ ٱنفِرُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱثَّاقَلْتُمْ إِلَى ٱلْأَرْضِ ۚ أَرَضِيتُم بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مِنَ ٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ فَمَا مَتَـٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّا تَنفِرُوا۟ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَيَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّوهُ شَيْـًٔا ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِلَّا تَنصُرُوهُ فَقَدْ نَصَرَهُ ٱللَّهُ إِذْ أَخْرَجَهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ثَانِىَ ٱثْنَيْنِ إِذْ هُمَا فِى ٱلْغَارِ إِذْ يَقُولُ لِصَـٰحِبِهِۦ لَا تَحْزَنْ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَنَا ۖ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَيْهِ وَأَيَّدَهُۥ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا وَجَعَلَ كَلِمَةَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ٱلسُّفْلَىٰ ۗ وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِىَ ٱلْعُلْيَا ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٤٠﴾

گەورەترە ، وەدەشگونجیٚ مەبەست لە خۆتان  تاوان لەگەڵ یەكترْدابیٚو بەو شیٚوەیە فەرمویەتی تا مرۆڤ هەستی ئەوەبكات كە هەمو خەڵك بەشیٚكن لەیەكترو ستەم لەكامیان بكریٚ لەوی تر كراوە لەسەر بناغەی{كُلُكُم مِن آدَمَ وَآدمُ مِن تُرَابٍ/ هەموتان لە ئادەمن‌و ئادەمیش لە خاكە}

ئاشكرایە كەئەمە دووخاڵی گرنگی تیٚدایە **یەكەم**:خوا دانەری یاساو بەرنامەی بونەوەرەو كەس ناتوانیٚ دەستكاری بكات، **دووهەم**: هەرئەبیٚ خوایش یاسای سەرزەوی دابنیٚو كەس بۆی نیە دەستكاری بكات، هەركەسیٚ بەوە رازی نیە بیٚ باوەڕو موشریكەو خوایش دەفەرمویٚ: جا غەزا لەدژی تەوای موشریكان بكەن لە هەموكاتدا وەك ئەوان شەڕ  لەگەڵ تەواوی ئیٚوەدا دەكەن لە هەموكاتیٚكا واتە: ئەم قەدەغەكردنەی كەباسكرا موشریكان ناگریٚتەوە مەگەر ئەو موشریكانەی كەپەیمانی كاتی دیارییان داوەو بە چاكی پەیمانەكەی خۆیان بەڕیٚوەبردبیٚت.

﴿وَقَـٰتِلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ كَآفَّةً﴾ وە دەگونجیٚ ﴿كَآفَّةً﴾ حاڵ بیٚ لە(واو)ی ﴿وَقَـٰتِلُوا۟﴾ واتە: هەموتان دژی موشریكان غەزابكەن‌و نابیٚ لەو شەڕانەدا هیچ كامتان دوا بكەون‌و بزانن، كە بەراستی ﷲ لەگەڵ پەرهیزكاراندایەو پشتیوان‌و یارمەتی دەریانە واتە ئەگەر ئیٚوە پەرهیزكاربون لە دوژمنانی خواو خۆتان مەترسن‌و هەمیشە ئامادەی گیان فیدایی وجیهادبن چونكە خواتان لەگەڵدایە، وەئەمە پاك كەرەوەی دڵ ودەرونی خواناسانە، چونكە وادەگەیەنیٚ كەئەگەر پەرهیزكار نەبویت لەو پشتیوانی‌و یارمەتی دانە بیٚ بەش ئەبی‌و سەرئەنجام تیٚ دەشكیٚیت، جاهەركەس دنیای دەویٚ باپەرهیٚزكار بیٚ وەهەركەس دوا رۆژی دەویٚ باپەرهیٚزكاربیٚ هەردوو ژیان لە پەرهیٚزكاریدایە، لەمبارەوە پیٚغەمبەرمانﷺ دەفەرمویٚ:{ إن الزمَانَ قَدْ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللهُ السموَاتِ وَالْأَرضَ السنَةُ اثْنا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ثَلَاثٌ مُتَوَالِيَاتٌ ذُو الْقَعْدَةِ وَذُو الحِجةِ وَالْمُحَرمُ وَرَجَبُ مُضَرَ الذِي بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ/البخاری/ بیٚگومان ئەم زەمانە دەخولیٚتەوە هەروەكوئەو رۆژەی كەﷲ ئاسمانان‌و زەوی دروستكردوە كەساڵ دوازدە مانگە كە چوارمانگی قەدەغەیە شەڕ تیٚدا كردنی سیانیان بەیەكەوەن، زولقەعدەو زوالحیجەو موحەڕم وەرەجەبی موزەڕ كەدەكەویٚتە نیٚوان جومادا‌و شەعبانەوە}ئینجا دەفەرمویٚ:

﴿٣٧﴾ بیٚگومان دواخستنی مانگە قەدەغەكراوەكان تا خوانەناسانی پیٚ گومڕا بكریٚت تەنها نیشانەی زیاتر چونە خوارەوەیە لە كوفرداو دەیانوت: رەحمان كیٚیەوحەرام‌و حەڵاڵ بەدەست خۆمانە؟ هەندیٚ جار ئەو مانگە قەدەغەكراوانەیان لەبیر خۆیان دەبردەوە ساڵی وابو موشریكان لەمانگی "موحەڕەم"داشەڕیان دەكردو مانگی "سەفەریان" قەدەغە دەكرد بەم شیٚوەیە مانگە قەدەغە كراوەكانیان بەناوساڵدا دەسوڕاندەوە ساڵیٚك حەڵاڵیان دەكردو ساڵیٚكیش حەرام‌و وەك خۆیان لیٚ دەكردەوە تا لەگەڵ ژمارەی ئەو مانگە قەدەغەكراوانەی خوادا ریٚك بكەویٚت ئابەم شیٚوەیە ئەوەی كە ﷲ قەدەغەی كردبو حەڵاڵیان دەكرد. بەراستی ناشیرینی كردەوەكانیان بۆجوان كرابو، واتە شەیتان كردەوەی ناشیرینی بۆ جوان كردبون ئاوا ئیشی خراپیان دەكردو پیٚیان وابو كە ئیشی باش ئەكەن قەدەغەیان حەڵاڵ دەكردو حەڵاڵیان قەدەغەدەكرد؟! ئەمانە بیٚ باوەڕو كافرن‌و خوایش گەلی كافر خۆش بەخت ناكات‌و نایخاتە سەر ریٚگای راست، ئینجا ﷲ رودەكاتە باوەڕداران‌و دەفەرمویٚ:

﴿٣٨﴾ ئەی ئەوانەی كەباوەڕتان هیٚناوە بۆچی وەختیٚ كە پیٚتان دەوتریٚت دەرچن بۆ جیهاد لە ریٚگەی خوادا خۆتان قورس دەكەن‌و دەلكیٚن بەزەویداو تەكان ناخۆن؟ ئایا ئیٚوە رازین بە ژیانی دنیاو دەی گۆڕنەوە بە ژیانی قیامەت؟ بەراستی ئاڵوگۆڕیٚكی خراپە ، چونكە ژیانی دنیا لە چاو ژیانی قیامەتدا هیچ نیە بیٚجگەلە كاتیٚكی زۆركەم. لیٚرە بەدواوە دەست دەكات بەسەرزەنشتی ئەو كەسانەی كەلە جەنگی تەبوك دا دواكەوتن‌و دەفەرمویٚ:

(٣٩) ئەگەر هەرکاتێك بانگكران بۆ دەرچون لەرێگای خوداداو ئێوە دەرنەچون بۆ جیهاد خوا سزاتان دەدات بەسزایەکی زۆر دەردناكو پرئێشو ئازارو ئێوەش لادەباو گەلێکی تر دادەنێ کە ئەوان وەك ئێوە نەبن ، واتە لەم خۆمات کردنو خۆشاردنەوەو پشت کردنەی جیهادەدا خۆتان زیانتان پێ ئەگاتو دوژمن زاڵ دەبێ بەسەرتانداو لەئاکامیشدا خوا ئەم بەرنامەیەی خۆی واز لێ ناهێنێو کەسانێکی ئازاو نەترسی بۆ دەگەیەنێو ئێوە هیچ زیانێك لەوزاتە نادەن تەنها خۆتان زیانتان لێ دەکەوێت و ﷲ توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو دەتوانێ بێ باوەڕو کافرو موشریك لە ناوببات بەڵام ئەوە ناکات تابەوان موسڵمانانی راستو دروست لە ئینسانی دوڕوو هەلپەرستو ترسنۆك جیابکاتەوەو سەرئەنجام بێ باوەڕانو کافران شکاوون هەرچەند دەسەڵاتو هێزیشیان هەبوبێت وەك دەفەرموێ: ﴿ قُل لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ سَتُغۡلَبُونَ وَتُحۡشَرُونَ إِلَىٰ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٢﴾ ﴾ آل عمران: ١٢.

(٤٠) ئەگەر ئێوە یارمەتی پێغەمبەرﷺ نەدەنو لەگەڵیا نەچن بۆ غەزا خۆتان زیان دەکەن، چونکە ئەگەر ئێوە ببن یان نەبن بەراستیﷲ یارمەتی دا، کەی؟ ئەوکاتەی کە کافران دەریان کرد لە مەکەو ئەو دووهەمی دوانەکان بو، واتەخۆیو ئەبوبکری صدیق بون کاتێك کە ئەودووانە لەناو ئەشکەوتی سەوردابون لەو کاتەی کە وتی بە رەفیقەکەی پەژارەو خەفەتت نەبێ چونکە بێگومان کە ﷲ مان لەگەڵدایەو یارمەتیمان دەداتولە دوژمنان دەمانپارێزێت، جا بەهۆی ئەو هەڵوێستە بەنرخەوە خوای باڵادەست ئارامشی نارد بۆ پێغەمبەرەکەییﷺو بەهێزی کردو یارمەتی دا بە سەربازانێك کە ئێوە ئەو سەربازانەتان نەدەبینی، بەڵێ ﷲ خاوەنی سەربازانێکی ئەوەندە زۆرە لە ژمارەدا نایەن بۆ ئێمەو هەردەم بەیەکێکیان تۆڵە لە ستەمکاران وەر دەگرێ، وەبەو شێوەیە ﷲ قسەو بریاری کافرانی ژێرخست و فرو فێڵی کافرانی پوچەڵکردەوە پێغەمبەرﷺ و یارەکەی لەدەست ئەوان رزگار کردو وشەو بریاریﷲ کە پاراستنی ئایینەکەی بو بەهۆی رزگارکردنی پێغەمبەرەکەیەوە سەری خستو ﷲ دەسەڵات دارو کاربەجێیە، نەکەس لە دژایەتی ئەودا سەردەکەوێتو ئەیباتەوەو نەبریاریکی گۆترەیە، واتە ئەگەر ئێوە ئەمرۆ یارمەتی نەدەنو لەگەڵیا دەرنەچن بۆ جیهاد وامەزانن کە خوا پێغەمبەرەکەی خۆی پشتگوێ دەخاتو ستەمکاران زاڵ دەکات بەسەریا، نەخێر شتی وانابێ مەگەر خۆتان نەتان دی کە کافران بریاری کوشتنی پێغەمبەریانﷺ دا لەمەکەدا بەڵام خوا پاراستیو چاوی ئەوانی لێ کوێرکرد بەتایبەت کاتێ کە لەئەشکەوتی سەوردا بو لەگەڵ یارە گیان فیداو راستگۆو بەوەفاکەی دا. بوخاری وموسلم هێناویانە کە ئەبوبکر ئەڵێ لەکاتێکا کەلەناو ئەو ئەشکەوتەدا بوین وتم بە پێغەمبەرﷺ ئەگەر هەرکام لەوان تەماشای بەردەمی خۆیان بکەن چاویان بەئێمە دەکەوێت، دەڵێ: پێغەمبەرﷺ فەرموی: {مَا ظَنُّكَ يَا أَبَا بَكْرٍ بِاثْنَيْنِ اللَّهُ ثَالِثُهُمَا / ئەی ئەبوبکر گومانت چۆنە بەدووکەس کە خوا سێهەمیانە؟} واتە دڵنیابە کە ئەوان ئێمە نابینن‌و خوا چاودێرو پارێزەرمانە، هەروەها لەبارەی وشەی ﴿وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ﴾ پێغەمبەرمانﷺ لەوەڵامی پرسیاری کابرایەکدا کەوتی: ئایا ئەگەر کەسێك شەڕ بکات بۆئەوەی بڵێن زرنگە یان لەبەر پارێزگاری لەنەتەوەو غیرەت پاڵی پێوە بنێ یان لەبەر ئەوەی خەڵکی ببینێ کامیان لەرێگەی خودایە؟ پێغەمبەرمانﷺ فەرموی:{ مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ /رواه الشيخان/ هەرکەسێ شەڕ بکات بۆ ئەوەی کە وشەی ﷲ ی بەدەسەڵاتو بەشکۆ بەرزببێتەوەو هیچی تری مەبەست نەبێت ئەوە لە رێگای خودایەو بەس} ﴿وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ﴾ وشەی ﷲ، ئایین‌و رێبازی ئیسلامە کە مانای وشەی﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ یە. وشەی بێ باوەڕانیش، هاوڵ دانانە بۆ خوا. ئینجا خوا بریاری دەرچون بۆ جیهاد دەدات، سوفیانی سەوری ئەڵێ: ئەمەی کەباسی ئەکەین واتە ئایەتی چلویەکی ئەم سورەتە یەکەم ئایەتی سورەتی تەوبەیە کە هاتوەتە خوارەوەو خوا دەفەرموێ:

(٤١) دەرچن بۆ جیهاد لەرێگەی خوادا سوکتانو قورستان لە خۆشیو ناخۆشیداو لە تەنگانەو فەرەحی داو بە لاوو بە پیرتانەوە بەناوداروو بێ ناوتانەوە بەدەوڵەمەندو فەقیرتانەوە واتە هیچ موسڵمانێك ماڧ ئەوەی نیە کەبمێنێتەوە لە ماڵداو نەچێت بۆ غەزا لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ ، ئەوسا جیهاد بکەن لەرێگای خوادا بەماڵتانو بەگیانتان خۆ هەر ئەوە چاکە بۆ ئێوە ئەگەر ئێوە بزانن چونکە بەسەر بەرزانە ئەژین‌و سەربەرزانە ئەمرن بەڵام ئەگەر دەرنەچن لەهەردوو ژیاندا سەرشۆڕو شەرمەندەن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:{ تَكَفَّلَ اللَّهُ لِمَنْ جَاهَدَ فِي سَبِيلِهِ لَا يُخْرِجُهُ إِلَّا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِهِ وَتَصْدِيقُ كَلِمَاتِهِ بِأَنْ يُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ أَوْ يَرْجِعَهُ إِلَى مَسْكَنِهِ الَّذِي خَرَجَ مِنْهُ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أَوْ غَنِيمَةٍ /رواه الشيخان/ خوا زامنی ئەو جیهاد کەرەی رێگاکەیەتی کە تەنها غەزاو باوەڕبون بەفەرمودەکانی ﷲ دەری کردوە لەماڵ کە ئەگەر مراندی بیخاتە بەهەشتەوە یان بیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵی خۆی لەگەڵ ئەو پاداش‌و دەسکەوتەی کەدەستی کەوتوە} ئەڵێن ئەبو تەڵحە سورەتی بەرائەتی خوێندەوە تا گەیشتە ئەم ئایەتەو وتی من واتێ دەگەم کە خوا داوای جیهادی لە پیرو لاو کردوە ئادەی کوڕ

ٱنفِرُواْ خِفَافٗا وَثِقَالٗا وَجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ لَوۡ كَانَ عَرَضٗا قَرِيبٗا وَسَفَرٗا قَاصِدٗا لَّٱتَّبَعُوكَ وَلَٰكِنۢ بَعُدَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلشُّقَّةُۚ وَسَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَوِ ٱسۡتَطَعۡنَا لَخَرَجۡنَا مَعَكُمۡ يُهۡلِكُونَ أَنفُسَهُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٤٢﴾ عَفَا ٱللَّهُ عَنكَ لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَتَعۡلَمَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٤٣﴾ لَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ أَن يُجَٰهِدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ﴿٤٥﴾ ۞ وَلَوۡ أَرَادُواْ ٱلۡخُرُوجَ لَأَعَدُّواْ لَهُۥ عُدَّةٗ وَلَٰكِن كَرِهَ ٱللَّهُ ٱنۢبِعَاثَهُمۡ فَثَبَّطَهُمۡ وَقِيلَ ٱقۡعُدُواْ مَعَ ٱلۡقَٰعِدِينَ ﴿٤٦﴾ لَوۡ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمۡ إِلَّا خَبَالٗا وَلَأَوۡضَعُواْ خِلَٰلَكُمۡ يَبۡغُونَكُمُ ٱلۡفِتۡنَةَ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٧﴾

ەکانم کەل وپەلی جیهادم بۆ ئامادە بکەن ئەوانیش وتیان نا، ڕەحمەتی خوات لێ بێ تۆ لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ غەزات کرد هەتا لە دنیادا کۆچی کرد ئینجا لەگەڵ ئەبوبکر تا وەفاتی کرد ئینجا لەگەڵ عمر تاوەفاتی کرد وائێستا ئێمەش لە جیاتی تۆ جیهاد دەکەین، بەگوێی نەکردن‌و لە کەشتی جیهاددا سوار بو لەناو دەریادا مردو هیچ وشکاییەکیان دەست نەکەوت کەتێیدا بینێژن تا پاش حەوت ڕۆژ کەهیچ نەگۆڕا ئەوسا ئەسپەردەیان کرد. سەعیدی کوڕی موسەیب کەچاوێکی نەمابو دەرچو بۆ غەزا کە پێی وترا تۆ نوقسانی غەزات لەسەر نیە وتی: الله داوای کردوە کە سوك وقورس دەرچن بۆ جیهاد جا ئەگەر نەشتوانم کە شەڕبکەم خۆ تاپۆی موجاهیدان زۆر دەکەم‌و پارێزگاری لەکەل‌وپەل دەکەم ئینجا خوا لۆمەی دنیا پەرستان دەکات‌و دەفەرموێ :

﴿٤٢﴾ ئەو کۆمەڵە مونافقانەی کە ئێستا گێرە شێوێنی دەکەن‌و دەیانەوێ لەگەڵ تۆدا دەرنەچن ئەوانە ئەگەر بۆ کەل‌و پەلێکی نزیك بوایە یان بۆ سەفەرێکی کورت بوایە خۆیان زۆر بە زویی ئامادە دەکردو دوات دەکەوتن، دنیا پەرستان تەنها بۆ دنیا لەگەڵتانن بەلام ئەو ڕێگایەیان بەهۆی سەختیەوە پێ دورەو ئامادەی ئەوە نین کەئەو ڕێگا دورە ببڕن‌و لەمەولاش کاتێ کە تۆ گەڕایتەوە بۆ ناوێان سوێند دەخۆن و دەڵێن بەخوا ئەگەر توانامان ببوایە لەگەڵ ئێوەدا ئێمەش دەردەچوین، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانە بێ باوەڕو درۆزنبون بۆیە خوا دەفەرموێ: ئەوان خۆیانیان فەوتاندوەو الله دەزانێت کە ئەوانە درۆ دەکەن. پێغەمبەر ﷺ کەم وابوە کە کەسێك بەهانەیەك باس بکات بۆی و تەریقی کردبێتەوە ئەوەبو لە کاتی ئەم دوا گەشتەی بۆ غەزای تەبوك هەندێك لە دڵنخۆش‌و دووروەکان، کەلەبەر پاراستنی ماڵ و گیانیان هاتبونە ڕیزی ئیسلامەوە بەلام هەمیشە لەناوەوە هەرخەریکی تانەو تەشەردان بون لە ئایین‌و لە پێغەمبەرو لەموسڵمانان، ئەمانە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ و هەریەکەو بەهانەیەکی بۆخۆی دەتاشی‌و داوای لە پێغەمبەر ﷺ دەکرد کە ماوەی بدات لە مەدینەدا بمێنێتەوە لەبەر ئەو بەهانانەی کە دەیوت، پێغەمبەریش ﷺ بەهانەکەی لێ وەر دەگرتن‌و ماوەی پێ دەدان کە دەرنەچن بۆ تەبوك‌و لە مەدینەدا بمێننەوە بەلام خوای داناو ئاگا ئەو ماوە دانەی پەسەند نەکردو لۆمەی پێغەمبەری ﷺ کرد بەم ئایەتەی کە دەفەرموێ:

﴿٤٣﴾ خوالێت خۆش بێ، بۆ ماوەت پێ دان کە دەرنەچن بۆ تەبوك؟ ـ بۆ؟ـ هەتا دەربکەوتایە بۆت ئەو کەسانەی کەراست دەکەن‌و درۆزنانیش بناسیت. جا الله دەفەرموێ:

﴿٤٤﴾ هەرگیز داوای ئیزنت لێ ناکەن ئەوانەی کەوا باوەڕیان هەبێت بەخواو بە ڕۆژی دوایی بۆ ئەوەی کە جیهاد نەکەن لەڕێگای خوادا بە ماڵیان‌و بەگیانیان، واتە مرۆڤی باوەڕداری ڕاستەقینە هەرگیز خۆی لە جیهادو ئیشی باش نابوێرێ، بەڵکو بۆ جیهادو ئیشی باش کێ بەرکێ دەکات‌و گیان وماڵی خۆی فیدا دەکات‌و الله زانەرە بەو کەسانەی کە پەرهێزکارن‌و دەزانێ کێ بۆچاکەو جیهاد کێ بەرکێ دەکات‌و کێیش ترسنۆك‌و بێ باوەڕە بۆ بەهانە دەگەڕێت بۆ خۆ دزینەوە لە جیهاد، وەك دەفەرموێ:

﴿٤٥﴾ هەر ئەوانە داوای ئیزنت لێ دەکەن بۆخۆدزینەوەلە جیهاد کە باوەڕیان نیە بە خواو بەرۆژی قیامەت‌و دڵیان گومانی تێدایە، ئەوسا ئەوان هەمیشە لەو گومانەی خۆیاندان‌و هەمیشە دوودڵن‌و لەسەر هیچ شتێك دڵیان دانامەرزێ‌و هەر هێزێك ئەبینن ئەڵێن ئێمە لەگەڵ ئێوەداین‌و باریان بۆ کەس نیەو خوایش سەربازی بێ نرخی ئاوای ناوێ، بۆیە دەفەرموێ:

﴿٤٦﴾ ئەگەر بیانویستایە دەرچن بۆ جیهاد بەراستی کەرەسەی جەنگی بۆئامادە دەکرد بەلام الله پێی ناخۆشە کە ئەوانە دەرپەڕن بۆ جیهادو بێنە ڕیزی سەربازە ڕاستەقینەکانییەوە لەبەر ئەوە ساردی کردنەوەو پێیان وترا دانیشن لەگەڵ دانیشتوەکاندا، واتە باخاوەن باوەڕانی ڕاستەقینە نەترسن‌و غەم‌و پەژارەیان نەبێ بەوەی کەلە کاتی جیهاددا کۆمەڵێك مرۆڤی دڵ

بەزیوو ترسنۆكو هەلپەرستو دوڕاو لێیان جیائەبێتەوە، چونكە خوا وای پێ خۆشە،

(٤٧) چونكە ئەگەر ئەمانە لەناو ئێوەدا دەریش بچونایە بۆ جیهاد ئەوانە زیاتر سەریان لەئێوە تێك دەداو بەقسەی درۆو پڕوپاگەندەی بێ جێ ئێوەیان لە دوژمنان دەترساندو لەناو ئێوەدا هەمیشە قسەی خراپیان بلاودەكردەوە چونكە مەبەستیان ئەوەیە كە ئێوە دوچاری بەڵاو ئێشو ئازاربنو لە ناو ئێوەشدا كەسانێك هەن كە گوێ لە قسە خراپەكانی ئەوان دەگرن كە سەرئەنجام ئەوكەسانە دەبنە هۆی لاوازی ریزی خاوەن باوەڕان كەواتە نەهاتنیان چاكەو بەسودە بۆتان ئەی خاوەن باوەڕان، ئەشگونجێ ﴿ وَفِيكُمۡ سَمَّٰعُونَ لَهُمۡ ﴾ مەبەستی ئەوكەسانەبێ كەلەناو ئێوەدا جاسوسی دەكەن بۆ دوژمنانی ئایین، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە خوا ئاگادارە بەسەر هەموشتێك دا تەنانەت ئەوەش كە نەبون ئەگەر ببوایە چۆن دەبون وەك لە سورەتی (الانعام)دا دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ بَدَا لَهُم مَّا كَانُواْ يُخۡفُونَ مِن قَبۡلُۖ وَلَوۡ رُدُّواْ لَعَادُواْ لِمَا نُهُواْ عَنۡهُ وَإِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ (٢٨) ئەوەی كە زوو شاردبویانەوە هەموی ئاشكرا دەبێتو ئەگەر جارێكی تریش ئەوانە بگەڕێنەوە بۆ دنیا بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەو ڕەوشتە ناپەسندەی پێشویان ، وە بەراستی ئەوان درۆزنن ﴾

لێرەش دووپاتی دەكاتەوەو دەفەرموێ: خوٙ ﷲ زۆر زانایی هەیە بەسەر ستەمكاراندا بۆیە هەندێك لەزانایان دەربارەی زانستی ﷲ دەفەرموون (**علم ماكان وعلم مايكون وعلم ماسيكون وعلم ما يكن لوكان كيف يكون**). ئینجا دەفەرموێ:

(٤٨) بەراستی ئەمانە هەر لەكۆنەوە پێش ئەم جەنگی تەبوكەش ئێش وئازارو بەڵایان ویستوە بۆ ئێوەو هەمیشە كاروباریان بەشێوەیەكی هەڵەوگەڕاوەی باسدەكرد بۆتۆ، بۆ تێكدانو چەواشەكاری هەتا حەق هات كە سەركەوتنی موسڵمانان بو، وە ئایینی خوا ئاشكرابو لەحاڵێكدا كە ئەوان پێیان ناخۆش بو، بەڵام هیچیان پێ نەكرا، جا ﷲ زیاتر پەردە لەسەر روی تاوان باران لادەداتو باشتر بە موسڵمانانیان دەناسێنێو دەفەرموێ:

(٤٩) ئەوسا لە ناو ئەو مونافقانەدا كەسی واهەیە كەدەڵێ: ئەی محمدﷺ ماوەم پێ بدە بامن دەرنەچمو دوچاری سزام مەكە ئەم ئایەتە لەبارەی (جەددەی كوڕی قەیسەوە)دابەزی كاتێ كە پێغەمبەرﷺ خەریكی خۆ ئامادەكردن بو بۆ جەنگی تەبوك بەو كابرایەی فەرمو: ئەی جەددەی كوڕی قەیس ئایا تۆ ئافرەتانی ڕێكوپێكی ڕۆمەكانت ناوێ؟ ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا

لَقَدِ ٱبۡتَغَوُاْ ٱلۡفِتۡنَةَ مِن قَبۡلُ وَقَلَّبُواْ لَكَ ٱلۡأُمُورَ حَتَّىٰ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَظَهَرَ أَمۡرُ ٱللَّهِ وَهُمۡ كَٰرِهُونَ (٤٨) وَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ ٱئۡذَن لِّي وَلَا تَفۡتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلۡفِتۡنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ (٤٩) إِن تُصِبۡكَ حَسَنَةٞ تَسُؤۡهُمۡۖ وَإِن تُصِبۡكَ مُصِيبَةٞ يَقُولُواْ قَدۡ أَخَذۡنَآ أَمۡرَنَا مِن قَبۡلُ وَيَتَوَلَّواْ وَّهُمۡ فَرِحُونَ (٥٠) قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ (٥١) قُلۡ هَلۡ تَرَبَّصُونَ بِنَآ إِلَّآ إِحۡدَى ٱلۡحُسۡنَيَيۡنِۖ وَنَحۡنُ نَتَرَبَّصُ بِكُمۡ أَن يُصِيبَكُمُ ٱللَّهُ بِعَذَابٖ مِّنۡ عِندِهِۦٓ أَوۡ بِأَيۡدِينَاۖ فَتَرَبَّصُوٓاْ إِنَّا مَعَكُم مُّتَرَبِّصُونَ (٥٢) قُلۡ أَنفِقُواْ طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا لَّن يُتَقَبَّلَ مِنكُمۡ إِنَّكُمۡ كُنتُمۡ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ (٥٣) وَمَا مَنَعَهُمۡ أَن تُقۡبَلَ مِنۡهُمۡ نَفَقَٰتُهُمۡ إِلَّآ أَنَّهُمۡ كَفَرُواْ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأۡتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمۡ كُسَالَىٰ وَلَا يُنفِقُونَ إِلَّا وَهُمۡ كَٰرِهُونَ (٥٤)

ﷺ ئایا ماوەم نادەیت كەدوچاری بەڵام نەكەیت؟ بەخوا گەلەكەم هەموی ئەم ناسێت كە من پیاوێكم زۆر زەوقم لە ئافرەت هەیەو من دەترسم ئەگەر بێمو لەوێ ئافرەتانی ڕۆم ببینم خۆم پێ ڕاگیر نەكرێو دوچاری تاوانو سزابېم، كەئەمەی وت پێغەمبەرﷺ وازی لێ هێناو ماوەی دا ئینجا ئەم ئایەتە دابەزیو تێی گەیاند كە زۆر هەڵەیە چونكە بەنەچونەكەی دوچاری سزادەبێ نەوەك بەچونی وەك دەفەرموێ: بائاگاداربێو چاك بزانێت بەم هەڵوێستە ناشیرینانەیان كەوتونەتە ناو سزاوەو بەم ڕەفتارانەیان بێ ئایینیو ستەمكاریو كوفری شاراوەیان ئاشكرا دەبێو بێگومان كەدۆزەخ چواردەوری كافرانی داوەو هەرگیز ڕزگارنابن لێی، ئینجا بۆچونو ڕەوشتێكی تری ناپەسەندیان باس دەكاتو دەفەرموێ:

(٥٠) ئەی محمدﷺ ئەگەر تۆ لەم جەنگەدا كەبۆی دەچیت سەركەوتیتو شتێكی باشت دەست كەوت ئەوان پێیان ناخۆشەو ناڕەحەت دەبنو ئەگەر هاتو توشی بەڵاو ناڕەحەتیش ببیت ئەڵێن بەراستی ئێمە خۆمان ئەمان زانی چۆن ئیش بكەینو سەرئەنجامی ئەو ئیشە ئاوادەبێ بۆیە دەرنەچوین جا بەكەیفو شادمانیەوە بەوەی كەرویداوە بۆپێغەمبەرﷺ وموسڵمانان و ئەوانی تێدانەبوە پشت تێدەكەن ، خودایش دەمكوتیان دەكاتو دەفەرموێ:

فَلَا تُعۡجِبۡكَ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُمۡۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُعَذِّبَهُم
بِهَا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَتَزۡهَقَ أَنفُسُهُمۡ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٥٥﴾
وَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنَّهُمۡ لَمِنكُمۡ وَمَا هُم مِّنكُمۡ وَلَٰكِنَّهُمۡ
قَوۡمٞ يَفۡرَقُونَ ﴿٥٦﴾ لَوۡ يَجِدُونَ مَلۡجَـًٔا أَوۡ مَغَٰرَٰتٍ
أَوۡ مُدَّخَلٗا لَّوَلَّوۡاْ إِلَيۡهِ وَهُمۡ يَجۡمَحُونَ ﴿٥٧﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَلۡمِزُكَ
فِي ٱلصَّدَقَٰتِ فَإِنۡ أُعۡطُواْ مِنۡهَا رَضُواْ وَإِن لَّمۡ يُعۡطَوۡاْ مِنۡهَآ إِذَا
هُمۡ يَسۡخَطُونَ ﴿٥٨﴾ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ رَضُواْ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ
وَرَسُولُهُۥ وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ سَيُؤۡتِينَا ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ
وَرَسُولُهُۥٓ إِنَّآ إِلَى ٱللَّهِ رَٰغِبُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ
لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱلۡعَٰمِلِينَ عَلَيۡهَا وَٱلۡمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمۡ
وَفِي ٱلرِّقَابِ وَٱلۡغَٰرِمِينَ وَفِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۖ
فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦٠﴾ وَمِنۡهُمُ
ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلنَّبِيَّ وَيَقُولُونَ هُوَ أُذُنٞۚ قُلۡ أُذُنُ خَيۡرٖ
لَّكُمۡ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَيُؤۡمِنُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ وَرَحۡمَةٞ لِّلَّذِينَ
ءَامَنُواْ مِنكُمۡۚ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ رَسُولَ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٦١﴾

(٥١) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ هەرگیز دوچاری ئێمە نابێت مەگەر ئەوەی کە ﷲ دایناوەو ویستویەتی بەسەرماندا بێتو ئێمەش بەبڕیاری ﷲ رازین‌و گەردنکەچین، چونکە هەرئەوە سەرپەرشتو دۆستو یارمەتی دەرمانەو تەنها با بە ﷲ باوەڕداران پشت ببەستن چونکە هەر ﷲ یە نزم بەرز دەکاتەوەو بەرزیش نزم دەکاتەوە، وەهەر ئەوە فەقیر دەوڵەمەند دەکاتو دەوڵەمەند فەقیرو کەسی تر هیچی لە دەست نایەت ئەگەر ئەو ئارەزۆنەکات. جابۆ ئەوەی مانای ئایەتەکان باشتر رۆشن ببێتەوە کورتەیێەك لە غەزای تەبوك باس دەکەین، گەرمای هاوین بوکە پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵی پێگەیشت کە سوپایەکی گەورەی رۆم خۆی ئامادەکردوەو ئەیەوێ هێرش بهێنێتە سەر موسڵمانان، پێغەمبەریشﷺ ئەم هەواڵەی بە یارەکانی داوو داوای لێ کردن هەرچی زوترە خۆیان ئامادەبکەن‌و تەنها جەنگێکیشە کە پێغەمبەرمانﷺ پێش دەرچونی باسی کردبێ‌و خەڵکی زانیبێتی بەرەو کوێ دەچن چونکە هەم کاتەکە سەخت بو هەم رێگاکە دوور بو پێویستی بەنان‌و خۆراکی زیاتربو هەم سوپای دوژمن زیاتر بو هەم کاتی پێگەیشتنی خورماو باغو بێستانی مەدینە بو، لەڕاستی دا تاقی کردنەوەیەکی سەخت بو هەروەك لە مێژودا ئەم سوپایە بە سوپای تەنگانەو سەخت ناوبراوە(جيش العسره)جا ئەوانەی راست ودڵسۆزی خۆیان‌و ئایین بون دەستیان کرد بەخۆئامادە کردن‌و هەرکەسێکیش بەگوێرەی توانای خۆی ماڵی ئەهێنا کە یەکێك لە چاکەکارە گەورەکانی ئەوکاتە عوسمان بوخوا لێی رازی بێت هەزار دیناری نارد بۆ پێغەمبەرﷺ و خۆیشی ئامادەبو هی وایشی بو تەنها دەیتوانی کوڵەدارێك بهێنێ‌و بیفرۆشێتو درهەمێ یان زیادو کەمی دەکرد ئەیهێناو ئەوەیشی کە توانای هیچکامیانی نەبو بەگریان‌و پەژارەوە لەمەدینەدا مایەوە کە ئەوانیش بەو نیەتە باشەیان بون بەهاوبەشی ئەو غەزا سەختو گەورەیەو چەند کەسێکی باشیش نەفس‌و شەیتان هەڵیدێران‌و نەچون‌و وەختێ کە پێغەمبەرمانﷺ گەڕایەوە راستیان پێ وتو پێغەمبەریش وازی لێ هێنان‌و داوای لەیارەکانی کرد کەکەس قسەیان لەگەڵدا نەکات بەلاَم چونکە ئەوانیش بەباشی لەو کارەی خۆیان پەشیمان بوونەوە ﷲ تەوبەی لێ وەرگرتن‌و پێغەمبەریشﷺ چاوپۆشی کردلێیان. جا ئیتر کەم کەم لەگەڵ ئایەتەکاندا درێژەی باسەکە ئەزانن ئینجا ﷲ بۆ ئەوەی زیاتر دوو روەکان سەرزەنش بکات رودەکاتە پێغەمبەرمان‌و ﷺ دەفەرموێ:

(٥٢) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بێجگە لە دوو شتی چاك چ شتێکی تر چاوەڕێ دەکەن بۆ ئێمە یان شەهید بونمانەو گەیشتنمانە بە رەزاو رەحمەتو نیعمەتی فرەوان‌و هەمیشەیی ﷲ یان سەرکەوتنمانە لە دنیادا بەسەر ئێوەدا؟ خۆئەمە لەحاڵێکدایە کەئێمە بۆ ئێوە دوو شتی خراپ چاوەڕێ دەکەین یان ئەوەی کە ﷲ خۆی دوچاری سزاتان بکاتو بتانکوژێت یان بەدەستی ئێمە خودا سزاتان بداتو بتانکوژین‌و بتان گرین سا ئێوە چاوەڕێ بکەن‌و ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕێ دەکەین سەرئەنجام دەزانن کامامن سەرکەوتو خۆشبەختین‌و کامیشمان دۆڕاوو رو رەش‌و شەرمەندەین، بەڵێ ﷲ زیاتر رقو تورەیی خۆی سەبارەت بە دووڕوان پیشان دەداتو هیچ خەیرو چاکەیەکیان لێ وەرناگرێتو دەفەرموێ:

(٥٣) پێیان بڵێ: ببەخشن جا بەکەیفی خۆتان بێ یان پێتان ناخۆش بێت هیچ جیاوازی نییە، لێتان وەرناگیرێت کە بەبێشك ئێوە گەلێکی فاسق‌و لە سنور تێپەڕیوون. چونکە ئەوان نەخۆیان پاکن‌و نەماڵەکانیان‌و خوداش پاکەو شتی پاك نەبێ وەری ناگرێ.

(٥٤) هیچ شتێك نییە کە رێگر بێت لەوەرگرتنی چاکەکانیان بێجگە لەئەوەی کە ئەوان بێ باوەڕن بەخواو بە پێغەمبەرەکەی‌و نوێژ ناکەن مەگەر بەشێوەیەکی لاملی‌و تەمەڵی‌و لەبەر چاوی خەڵکی‌و نابەخشن مەگەر بەشێوەیەکی نابەدڵی چونکە چاوەڕوانی پاداشتەکەی نین. بەم شێوەیە دەردەکەوێت ئەگەر بیرباوەڕی راستەقینە لە دڵەکاندا جێگیر نەبێ ئەو خاوەن دڵانە هەرچەند چاکەو ئیشی باشیش بکەن لەلای خوا هیچ نرخێکی

نیەو هیچ پاداشتێکیشی پێ نادرێتەوە، ئینجا خوای داناو ئاگا، دڵی باوەڕداران ئەداتەوەو تێیان دەگەیەنێت کەبە سەروەتو سامانی بێ باوەڕان دڵگران نەبن‌و بەشتێکی زۆر گرنگی دانەنێن‌و دەفەرموێ:

(٥٥) جا بازۆری ماڵو منالی ئەو کافرانە وات لێ نەکات کە سەرت سوڕبمێنێ‌و بە شتێکی گرنگی بزانی ئارەزۆی خوا لەسەر ئەو سەروەتو سامان‌و منالّ پێدانەی کافران بێجگەلەوەی کەئەیەوێ بەو ماڵو منالە سزایان بدات لەدنیاداو گیانیان دەربچێت بەبێ باوەڕی‌و کافری شتێکی ترنیە، چونکە بەهۆی ئەو سەروەتو سامانە زۆرەوە زۆر ماندو دەبن‌و هەمیشە ئەترسن لەدەستیان بچێت‌و هەمیشە لەبیری زۆرکردنیدان‌و بێ ئاگادەبن لەمردن‌و پاشەڕۆژو هەرگیز ناگەڕێنەوە لەتاوان‌و خراپەکردن تا سەرئەنجام بەبێ باوەڕی‌و کافری ئەمرن‌و هەمو سەروەتو سامانەکانیان بەجێ ئەمێنێ‌و زۆرجاریش کەلەپوربەری راستەقینەش سودی لێ نابات بەڵکو لە بانکەکاندا کەسانێ ئەیبەن‌و ئەیخۆن کە هیچ پەیوەندییەکیان بە خاوەن سامانەکەوە نەبووەو نیە واتە لە کۆکردنەوەی ئەو سەروەتو سامانە زۆرە سودێکی شایەنیان دەست نەکەوت بەڵکو حسابو سزای سەخت چاوەڕێیانە، ئینجا ﷻ سیفەتێکی تری دووڕووە کانمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٥٦) جا ئەوان سوێند دەخۆن بەخواو دەڵێن: بەبێگومان ئێمە لە ئێوەین بەلاّم خوا بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: ئەوسا ئەوان لە ئێوە نین‌و موسڵمان نین‌و درۆ دەکەن، بەلاّم راستی ئەوەیە کەئەوان گەلێکی ترسنۆکن لەبەر ترسنۆکی خۆیان هەمیشە خۆیان بەرواڵەت بەخاوەن باوەڕو دۆستی باوەڕداران ناوئەبەن‌و هەمیشەیش سوێند دەخۆن لەسەر ئەوەی کەراستن، نەخێر ئەمانە درۆزن‌و ترسنۆکن.

(٥٧) ئەگەر ئەوان پەناگایەك یان ئەشکەوتێك یان هەر کون‌و کەلەبەریەکیان دەست بکەوێت هەرکەناوی جەنگو جیهاد برا بەرەو ئەوێ دەچن جا نەك چونێکی سروشتی بەڵکو ئەوان زۆر پەلەدەکەن‌و پاڵ دەنێن بەیەکترەوە تا زووتر بگەنە ئەو شوێنەو خۆیان بشارنەوە. بەڵێ قورئان ئابەوشێوەیە ترسنۆکی دووڕووەکان پیشان دەداتو نرخیان نایەڵێت تا موسڵمانان بە نەفەری وا زۆر دڵخۆش نەکەن بەڵکو بە پاك‌و خاوێنی‌و پەرهیزکاری ریزەکانی خۆیان دڵخۆش بن، چونکە خوا لەگەڵ پەرهیزکاراندایە کەمبن یان زۆر، دوژمن‌و شکێنەری ستەمکارو ملهوڕانە هەرچەند خاوەن هێزو بەدەسەلاّت بن، ئینجا خوا زیاتر رەوشتە ناپەسەندەکانی دووڕووەکان رۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٥٨) ئەوسا لەناوئەواندا کەسانێك هەن کە تانەو تەشەرت لێ دەدەن‌و لەبارەی بەخشین‌و دابەشکردنەوە گاڵتەت پێ دەکەن جا ئەگەر لەو سەروەتو سامانەی کەدەستتان دەکەوێت بەشیان بدەیت رازی دەبن بەلاّم ئەگەر لەوسەروەتو سامانە پێیان نەدرێت ئیتر ئەوان رازی نین‌ورق لەدڵن و دەست دەکەن بەتانەو تەشەردان لە ئایین‌و دژایەتی پێغەمبەرﷺ دەکەن، واتە ئەمانە هەمو شتێکیان هەر لەبەر دنیایە،

(٥٩) خۆ ئەگەر ئەوان رازی بونایە بەوەی کە خواو پێغەمبەرەکەیﷺ پێیان دابون‌و بیان وتایە خودا بەسە بۆمان بەم زوانە ﷻ لە بەرەکەتو فەزڵی خۆی پێمان دەدات هەروەها پێغەمبەرەکەیشیﷺ لەوەی کەدەستی دەکەوێت یارمەتیمان دەداتو خۆیان بگرتایەو قسەی باشیان بکردایەو بیان وتایە بێگومان ئێمە هەر روو لەخوداین‌و رازی بەو بەشەین کە پێی داوین ئەوە باشترین قسەبو بۆیان ولەهەردوو ژیاندا خۆش بەخت دەبون، جا بەهۆی دابەشکردنی دەسکەوتەکانەوە باسی دابەشکردنی زەکات کە یەکێکە لە واجبە گرنگە کانی سەرشانی موسڵمانی ماڵ و سەروەتدار دەکات، کەبەراستی بەخێوکردنێکی کۆمەلاّیەتی زۆرگرنگەو زۆرجار کەباسی نوێژ کراوە باسی زەکاتیشی لەگەڵدا کراوە وەك لەسەرەتای سورەتی بەقەرەدا باسمان کرد، بەڵێ ئەم زەکاتە ئەوەندە گرنگە خوا خۆی زەکات بەرانی دیاری کردوە، ئەڵێن جارێك کابرایەك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺ وداوای زەکاتی لێ کرد پێغەمبەرﷺ فەرموی:{ **إن اللَه تَعالَى لَمْ يَرْضَ بِحُكْمِ نَبِي وَلَا غَيْرِهِ فِي الصدَقَاتِ حَتى حَكَمَ فِيهَا هُوَ فَجَزأَهَا ثَمانِيَةَ أجْزَاءٍ فَإنْ كُنتَ مِنْ تِلْكَ الأَجْزَاءِ أَعْطَيْتُكَ حَقكَ** /أبو داود/بێگومان کە ﷲ ی بڵند مەقام رازی نەبوە کەس لەبارەی دابەشکردنی زەکاتەوە بڕیاربدات نە پێغەمبەرو نەغەیری پێغەمبەرو زەکات بەرانی کردوە بەهەشت بەشەوە جائەگەر تۆ یەکێك بی لەو هەشت بەشە ئەوا لەزەکات مافی خۆتت پێ دەدرێت، ئەگینا پێت نادرێت} مەبەستی پێغەمبەرﷺ لەو هەشت بەشە ئەمەیە کە خوا دەفەرموێ:

(٦٠) زەکات تەنها بەمانە ئەدرێت، یەکەم: فەقیر.

دووهەم:کەم دەست وشەی(فەقیرو مسکین)ئەگەر بەجیابن هەردوو مانایان یەکە بەلاّم ئەگەر هەردووکیان بەیەکەوەهاتن وەك ئێرە ماناکەیان جیایە، جا لەبارەی ماناکانیانەوە چەند شت وتراوە لەوانە، فەقیر واتە: ئەوکەسەی کە هیچی نەبێ‌و مسکین واتە: ئەوکەسەی کە هەیبێ بەلاّم بەشی نەکات وەپێچەوانەش ماناکراون، بەهەرحاڵ ئەوەی هیچی نەبێ یان هەیبێ بەلاّم بەشی نەکات لە زەکات بەشیان دەدرێت،

**سێهەم:** بریتیە لەئەوکەسانەی کە ئیش دەکەن بۆ کۆکردنەوەی زەکات واتە مەئموری زەکات کۆکەرەوە لەو زەکاتەی پێ دەدرێت چونکە ئەگەر خۆی خاوەن بەش بێ‌وموچەی دیاری کراوی نەبێت دڵسۆزانە تر ئیش ئەکات.

**چوارەم:** بریتیە لە ئەوانەی کەتازە موسڵمانبن تابەو زەکاتە دڵیان پتەوتر ببێت لەسەر ئایین یان بەهۆی بەخشین بەوان خزم‌و کەس‌و کاری ئەوانیش باوەڕبهێنن یان بەخشین بەکەسێکی بێ باوەڕ بەتەمای موسڵمان بوونی یان بۆپارێزگاری کردنی موسڵمانان واتە ئەگەر چی لەم وێنەی دواییەدا زەکات دانە بەکافرو بێ باوەڕ بەڵام چونکە چاوەڕوانی سودی لێ دەکرێت بۆ موسڵمانان شتێکی باشەو دروستە،

**پێنجەم:** بدرێتی بۆ ئازادکردنی بەندەکان، یاسای بەندایەتی لەو سەردەمەدا یاسایەکی گەورەی سەردەم بووەو ئیسلام دای نەناوە، بەڵکو ئیسلام کەهات دەیان شێوەی دانا بۆ ئازاد کردنی لەوانە دانانی بەشێکی گەورەی زەکاتی موسڵمانان بۆ ئازاد کردنیان واتە بەراستی ئیسلامە تاکە سەرپەرشتو خەمخۆری راستەقینەی مرۆڤەو بەهەمو شێوەیەك هەوڵی داوە ئازاد بێ تەنانەت لە هەڵبژاردنی ڕێگاو ڕێبازدا وەك دەفەرموێ:(**لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ**)بەڵێ ئیسلام لە دنیایەکی خەیاڵدا ناژی بەڵکو لە دنیایەکی واقیع‌و بەرچاودا دەژی‌و دەزانێ مرۆڤ بێ سەرپەرشتو بێ یاساو بێ گەورەو بچوکی ناتوانێ بژێت جا ئەگەر یاسایەکی بێ لایەن‌و دادگەرو یەکسانی نەبێت، یاسایەکی تر دەبێ هەبێت لەبەر ئەوە زۆری لێ دەکات کە دەبێ یاسایەکی یەکسان بۆ نەوەی بەشەرو دادگەر کە بریتیە لە یاسای ﷲ هەڵبژێرێت هەربەوەش مرۆڤ لە بەندایەتی مرۆڤ ئازاد دەکات‌و هەمویان دائەنێ بە بەندەی دروستکەرو سەرپەشتیکارو بەخێوکەری راستەقینەو هەمویان لە بەرانبەر ئەوزاتەوە یەکسانن‌و لە دادگای ئەو یاسایەدا مرۆڤ هەمویان بەیەك چاو تەماشا دەکرێن، جا دانانی ئەم بەشە لە زەکات بۆ ئازاد کردنی بەندەکان باشترین بەڵگەی خەمخۆری‌و دڵسۆزی ئیسلامە سەبارەت بەنەوەی ئادەمیزاد، جائەمڕۆ هەرلەسایەی ئیسلامەوە ئەم بەشە لەوڵاتی ئیسلامیدا بەو شێوەیە لەئارادا نەماوە بەڵام لەو وڵاتانەی کە دەهۆڵی ئازادی‌و ماڤ مرۆڤ گوێچکەی خەڵك کەڕدەکات هێشتاهەرماوە؟!! جائەو بەشەی زەکات دەتوانرێت لە ئازادکردنی موسڵمانان لەدەستی ستەمکارو لە بیرو بۆچونی فریودەران‌و رزگارکردنی زیندانیە موسڵمانەکاندا بەکار بهێنرێت والله اعلم.

**شەشەم:** بژاردنەوەی قەرزی ئەوکەسانەی کە لەسەر شتی حەڵاڵ قەرزار بوبێ، یان ئەگەر لەسەر شتی حەرامیش بێ ئەگەر بەباشی تەوبەیان کردبێ‌و قەرزیان لەسەر مابێ‌و توانای بژاردنەوەیان نەبێ.

**حەوتەم:** بریتیەلە لەرێگای خوادا کەئەمە دەرگایەکی بەربڵاوو فراوانەو هەمو ئیشێکی چاکی گشتی ئەگرێتەوە کەسەر ڤاقڵەیان بریتیە لەو کەسانەی کە جیهاد دەکەن لە رێگای خوادا تالەبیری سەروەت‌و ساماندا نەبن‌وخەمی لەناوچونی نەخۆن و بەتەلاش وجیهادی خۆیانەوە سەرگەرمبن چونکە بەشێکی زەکاتی موسڵمانان بۆ ئەوانە.

**هەشتەم:** ڕێبواران ئەو ڕێبوارانەی کەلە ڕێگادا بەهەرهۆیەك پارەیان لێ ئەبڕێ‌و نیازیان بەیارمەتی دەبێ، پێویستە لەو بەشەی زەکات کەبۆ ڕێبواران دانراوە بەشیان بدرێت، جا ئەگەر دەوڵەمەند بو بەقەرز وەرگرێت‌و پاش گەڕانەوەی بیداتەوە ئەوەچاکترە، واتە ئیسلام هەنگاو بە هەنگاولەگەل مرۆڤدایە هەرگیز بەتەنها بەجێی ناهێڵێت، ئینجا خودا دەفەرموێ: ئەمە شتێکی پێویست کراوە لەسەرشانی موسڵمانان لەلایەن ﷲ ـەوەو ﷲ زانایەو پێویستیەکانی مرۆڤ دەزانێ‌و هەموئیشی بەحیکمەتەو لە جێی خۆیدایە.ئینجا ﷲ زیاتر پێناسەی دووڕوان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٦١) جا لەناو ئەو مونافق‌و دووڕوانەدا کەسانێك هەن کە ئازاری پێغەمبەرﷺ دەدەن بەتانەو تەشەردان لێی‌و دەڵێن: ئەو گوێ لەهەمو قسەیەك دەگرێ‌و چاك‌و خراپ لەیەك جیاناکاتەوەو هەرکەسێ هەرچی لابڵێت باوەڕی پێ دەکات ئەمە هەم تانەبو لە پێغەمبەرﷺ هەم دڵخۆشکردنی دووڕووەکانی رەفیقیان بو چونکە دەیان وت هەرچی ئەڵێن لەپاش ملە بیڵێن‌و مەترسن لە محمد ئەگەر قسەیشی بۆکرا بچن سوێندی بۆ بخۆن‌و بڵێن درۆیە باوەڕتان پێ دەکات، ئینجا ﷲ دەفەرموێ: ئەی محمدﷺ بڵێ: من گوێگری قسەی چاکم کە وەحی خوایە بۆ ئێوە، ئینجا خوا دەمکوتی تاوانباران دەکات‌و دەفەرموێ: ئەو پێغەمبەرەﷺ باوەڕی بەفەرمودەکانی خوا هەیەو هەرچی دەفەرموێ بەراستی ئەزانێ‌و باوەڕی بەراستی‌و دروستی موسڵمانان هەیە لەبەر ئەوە بەچاکی گوێیان لێ دەگرێت، بەڵێ ئەم ناپاکانە لەو حەوسەڵەو شەرمەی پێغەمبەرمانﷺ بەشێوەیەکی خراپ سودیان وەردەگرت، پێغەمبەرﷺ کەسی تەریق نەدەکردەوە ئەگەرچی بەچاکی کابرایشی دەناسی، وەئەو سۆزو میهرەبانیەکی زۆری هەیە بۆ ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ناو ئێوەدا، ئینجا خوا تووڕەیی خۆی سەبارەت بەو ناپاکانە دەردەبڕێ‌و دەفەرموێ: ئەوسا ئەوکەسانەی کە ئازاری پێغەمبەری خوا دەدەن بۆ ئەوان سزایەکی پڕ ئێش‌و ئازارو دەردناك هەیە. جا(ﷲ) ترسنۆکی ئەو دووڕوانە زیاترئاشکرا دەکات‌و دەفەرموێ:

يَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ لِيُرۡضُوكُمۡ وَٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَحَقُّ أَن يُرۡضُوهُ إِن كَانُواْ مُؤۡمِنِينَ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّهُۥ مَن يُحَادِدِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَأَنَّ لَهُۥ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدٗا فِيهَاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡخِزۡيُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٣﴾ يَحۡذَرُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيۡهِمۡ سُورَةٞ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلِ ٱسۡتَهۡزِءُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ مُخۡرِجٞ مَّا تَحۡذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَقۡبِضُونَ أَيۡدِيَهُمۡۚ نَسُواْ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمۡۚ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ هِيَ حَسۡبُهُمۡۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّقِيمٞ ﴿٦٨﴾

(٦٢) سوێند بەخوا دەخۆن بۆ ئێوە تا ئێوە رازی بکەن. دەڵێن پیاوێك لە دووڕووەکان وتی: وڵڵاهی ئەگەر ئەوەی کە محمدﷺ دەیڵێت راست بێ ئێمە خراپترین لە گوێ درێژ باوەڕدارێکیش گوێی لێ بو وتی: وەڵڵاهی ئەوەی کە محمد ئەیڵێت راستەو ئێوە خراپترن لە گوێ درێژ ئەم قسەیە گەیشتە پێغەمبەرﷺ و ناردی بەشوێن کابراداو هێنراو فەرموی: بۆ وات وت؟ کابرای دووڕو دەستی کرد بە سوێند خواردنو نەفرین کردنو سوێندی دەخوارد کە شتی وای نەوتوەو باوەڕدارەکەیش هەر دەیوت خوایە راستگۆو درۆزن لە یەکتر جیابکەرەوە، جا ﷲ ئەم ئایەتەی رەوانە کردو فەرموی ئەوان سوێند دەخۆن بۆ ئێوە تا ئێوە رازی بکەن، لەحاڵێکدا کەخواو پێغەمبەرەکەیﷺ شایستەترە بەوەی کە رازی بکرێت ئەگەر ئەوان باوەڕداربونایە، واتە دەبوایە لە خوا بترسانایەو بەدڵ لەگەڵ خوادا بونایەو دڵی پێغەمبەریان رازی بکردایە نەك بەدرۆ هەوڵ بدەن تا باوەڕداران لە خۆیان رازی بکەن، ئینجا ﷲ هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەفەرموێ:

(٦٣) ئایا ئەوان نازانن کە هەرکەسێك دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرکەی بکات ئاگری دۆزەخی بۆهەیەو هەمیشە لە ناویدا دەمێنێتەوە؟ کە بەراستی ئەوە سەرشۆڕیەکی زۆر گەورەیە بۆ ئەوان. ئینجا دەفەرموێ:

(٦٤) دووڕووەکان دەترسن کە سورەتێك لە دژی ئەوان رەوانە بکرێتو هەمو کەینو بەینێکیان ئاشکرابکاتو ژیانو گیانیان بخاتە مەترسیەوە، جا خودایش بەردی سارد دەدا بەدڵیانداو چەند دەترسن سەد ئەوەندەی تر دەیان ترسێنێو دەفەرموێ: ئەی محمد پێیان بڵێ: با هەرگاڵتە بکەن بێگومان کەﷲ ئاشکراکەری ئەوەیە کە ئێوە لێی دەترسن کە هاتنی ئەم ئایەتانەیە کە دەفەرموێ:

(٦٥) ئەگەر پرسیاریان لێ بکەیتو بڵێیت بۆچی قسەی واتان کردوە دەڵێن: ئێمە ئەو قسەمان بەگاڵتەو شۆخی کردوە مەبەستی ترمان نەبوە. خوایش دەفەرموێ: ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ ئایا بە خواو بەئایەتەکانیو بە پێغەمبەرەکەی گاڵتە دەکەن؟

(٦٦) هیچ بەهانەیەك مەهێننەوە بەحەقیقەت ئێوە کافربوون لەپاش ئەوەی کەباوەڕتان بوە، واتە گاڵتەکردن بەخواو بەئایەتەکانی خواوبە پێغەمبەر ئەبێ بەهۆی کافربون، ئەی قسە وتن بەناموسی پێغەمبەر پیسترین جنێونیە بەو خۆشەویستە؟ دەی چۆن کافر نابن؟! خۆ زانایان بەلایانەوە وایە ئەگەر کەسێ بەگاڵتەوە وتی: وەرە با قومار بکەین یان عارەق بخۆین کافر دەبێ چونکە گاڵتە کردنە بەو ئایەتانەی خوا کە ئەو شتانەی قەدەغەکردوە، بەداخەوە ئەمڕۆ موسڵمانان هیچ حسابێك بۆ قسەکانی خۆیان ناکەن.

ئینجا ﷲ دەفەرموێ: ئەگەر چاو پۆشی لەکۆمەڵێکێتان بکەین کەبەچاکی پەشیمان ببێتەوە باچاك بزانن کە بێگومان کۆمەڵێکتان هەر سزا دەدەین چونکە بەراستی ئەوان تاوانبارنودەبێ تۆڵەی خۆیان وەربگرن، جا خوا زیاتر پەردە لەسەر روی مونافقان لادەداتو دەفەرموێ:

(٦٧) پیاوانی مونافقو ژنانی مونافق هەندێکیان لە هەندێکیانن‌ولەیەکدەچنو پاڵ پشتو لایەنگرو یارمەتی دەری یەکترن، وەئەم چوار سیفەتە ناپاکەیان هەیە **یەکەم**: هەمیشە فەرمان دەکەن بەخراپە. **دووهەم**: بەرگری دەکەن لە چاکە. **سێهەم**: دەستیان قوچاوەوڕژدنو چاکە ناکەن. **چوارەم**: خوایان لە بیر چوەتەوە خوایش ئەوانی پشتگوێ خستوەو نایانخاتە سەر رێگای خۆشبەختی بێگومان ئەوانەی کە مونافقن هەرئەوانن فاسقو لە سنوری خوا دەرچوونو دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن ئاشکرایە سزای ئەم جۆرە دووڕوانە ئەبێ زۆر توندو سەخت بێ، چونکە هەڵسو کەوتیان ئەوەندە ناشیرینو نالەبارە هەمو مرۆڤێکی خاوەن ویژدانو رەوشتجوان بێزی لێ دەبێتەوە، چاکە بەخراپە دابنێو بەرگری خەڵکیشی لێ بکاتو خراپە بەچاکە دابنێتو خەڵکیشی بۆ بانگ بکاتو هەمیشە هەرخەریکی کۆکردنەوەی دنیا بێتو کەچی ئەوەند رژدو بەخیل

كَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنكُمْ قُوَّةً وَأَكْثَرَ أَمْوَٰلًا وَأَوْلَٰدًا فَاسْتَمْتَعُواْ بِخَلَٰقِهِمْ فَاسْتَمْتَعْتُم بِخَلَٰقِكُمْ كَمَا اسْتَمْتَعَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُم بِخَلَٰقِهِمْ وَخُضْتُمْ كَالَّذِي خَاضُوٓاْ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالْأٓخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ الْخَٰسِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ يَأْتِهِمْ نَبَأُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوْمِ إِبْرَٰهِيمَ وَأَصْحَٰبِ مَدْيَنَ وَالْمُؤْتَفِكَٰتِ ۚ أَتَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَٰتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٧٠﴾ وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ الزَّكَوٰةَ وَيُطِيعُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ أُوْلَٰٓئِكَ سَيَرْحَمُهُمُ اللَّهُ ۗ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٧١﴾ وَعَدَ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَٰتِ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةً فِي جَنَّٰتِ عَدْنٍ ۚ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ اللَّهِ أَكْبَرُ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٧٢﴾

بێت هیچ شتێك نەبەخشێت بەڵكو هیچ ئاگایەكی لە سەرچاوەی هەستی نەبێو هەرگیز بیر لەو زاتە نەكاتەوە! جا ئاوا مرۆڤێك دەبێ بێجگە لە سزاو نەفرینیﷲ چ شتێكی تر چاوەڕوانی بكات؟ ئەوەتە خوای داناو توانا سەبارەت بەپاشە ڕۆژی ئەوانە دەفەرموێ:

(٦٨) ﷲ بەڵێنی ئاگری دۆزەخی داوە بە تەواوی پیاوو ئافرەتانی مونافقو بەسەرجەمی كافران كە بۆهەمیشە دەخرێنە ناوییەوە كە هەر ئەوە بەسە بۆیانو ﷲ نەفرینی لێ كردونو بۆ ئەوان هەیە سزایەكی هەمیشەیی.

(٦٩) وەك ئەو كەسانەی كەلە پێش ئێوەدا بوون كە بەهێزتر بوون لە ئێوەو زۆرتریش بوون لە ژمارەی سەروەتو سامانو منداڵاندا، جا ئەوان لەدنیادا بەو بەشەی خۆیان تامو لەزەتیان وەرگرتوپێیان ڕایان بوارد و ئێوەش لەبەشی خۆتان تامو لەزەتتان وەرگرت هەروەك تامو لەزەت وەرگرتنی ئەو كەسانەی كەلە پێش ئێوەدا بوون بەئەو بەشەی كە پێیان درابو، وە ئێوە لە خراپەو خراپە كاریدا زۆر چوونە خوارەوە وەك ئەو كەسانەی كەلە پێش ئێوە وایان بەخۆیان كرد واتە: ئەی تاوانبارو دووڕووەكان تاكەی لە تاوانو دووڕوویی وازناهێنن هەرچەندە ڕابوێرن سەرئەنجام هەروەكو ئەوانەی پێش خۆتانتان لێ دێتو ئەبێ بگەڕێنەوە بەردەم دادگای ﷲ ، ئینجا دەفەرموێ: ئائەوانە كردەوەكانیان هەم لە دنیاداو هەم لە قیامەتدا هەڵوەشاوەیە، وەئەوانە هەرخۆیانن زەنجەڕۆو زیان لێ كەوتو، ئینجاﷲ بۆ ئەو گەلە خراپو دووڕوانە باسی گەلانی پێشویان بۆ دەكات بەڵكو بیر بكەنەوەو واز لە تاوانو خراپە بهێننو دەفەرموێ:

(٧٠) ئایە نەهاتوەتە لای ئەوان هەواڵی ئەوانەی پێش خۆیان كە بریتی بون لە گەلی (نوح) كەلە پێش ئەواندا بوون كەبە تۆفان لە ناوچونو گەلی عاد كە دژایەتی پێغەمبەركەی خۆیانیان كرد كە (هود) بو خوا بەبایەكی حەوت شەو هەشت ڕۆژ لە ناوی بردن وەهەروەها گەلی سەمود كە دژایەتی پێغەمبەرەكەی خۆیانیان كرد كە (ساڵح) بو وشترەكەیان كوشتو خوایش بەدەنگێك لە ناوی بردن، وەگەلی (ئیبراهیم) كە خوا ئەوی لە ئاگر ڕزگار كردو نەمرودی كوڕی كەنعانی پاشایانی لەناوبرد، وەگەلی مەدیەن كە دژایەتی پێغەمبەركەیان كرد كە (شوعەیب)بو خوایش بە بومەلەرزەو دەنگو سزایەكی سێبەر لەناوی بردن، وەگەلی (لوت) كە دژایەتی ئەویان كردو بەئیشی خراپەوە خەریكبون خوا هەمویانی لەناو بردو لوتی ڕزگاركرد، جاخوا ستەمی لەوان نەكردوە بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان كرد. ئینجا خوا پاش باسكردنی سیفەتە ناپەسەندەكانی دووڕووەكان باسی خاوەن باوەڕانو سیفەتە جوانەكانیان دەكاتو دەفەرموێ:

(٧١) پیاوە باوەڕدارەكانو ئافرەتە باوەڕدارەكان هەندێكیان سەرپەرشتو دۆستو یارمەتی دەری هەندێكیانن كە فەرمان دەكەن بەچاكەو بەرگری دەكەن لە خراپەو نوێژ دەكەنو زەكات دەدەن، وەپەیڕەوی خواو پێغەمبەرەكەیﷺ دەكەن، ئینجا خودا دەفەرموێ: ئائەوانە بەم زووانە خوا ڕەحمیان پێ دەكات بێگومان كە ﷲ دەسەڵات دارەو پەیڕەوانی بەهێزدەكاتو دوژمنانی سەرشۆڕ، دانایە لەكارو بەرنامەو پاداشو سزای داو لەهیچ كاروبڕیارێكیدا شتێكی گۆترەكاری تێدانیە.

ئینجا خوا هەروەك لە پێشەوە پاش وەسفی دووڕوەكان سزاكەیشی بۆ باس كردین وا لێرەش پاش وەسفی باوەڕداران، پاداشەكەیان باس دەكاتو دەفەرموێ:

(٧٢) خوا بەڵێنی داوە بەو پیاوە باوەڕدارانەو بەوئافرەتە باوەڕدارانە بە چەندین باخو باخاتێك كەلە ژێر ئەو باخانەدا چەندین جۆگا دەڕواتو ئەوان ئەمێننەوە تێیدا بۆ هەمیشەییو چەندین جێگای پاكو خاوێن لەناو باخەكانی جێگای دانیشتنداو خوا ڕازییە لێیان كە ڕەزامەندی خوا لەهەمو شتێك گەورەترە بەراستی ئەوەیە خۆشبەختیو بەهرەی گەورە كە ﷲ دەیدات بەو باوەڕدارانە. جاكێ تامەزرۆی ئەو بەهرەو پاداشتە گەورەیە با هەوڵی بۆ بداتو ئەو سیفەتە بەنرخانەی تێدا بێتە دی

دڵنیابێت کە الله بەڵێنی خۆی ئەباتە سەر، شایانی باسە بەهەشت هەرچۆنێ بیری لێ بکەینەوە لە خۆشیو جوانیو پاکیدا ناگەینە ئەوە کە دەرکی تامو لەزەتی راستەقینەی لێ بکەین، بێجگە لەو هەمو باسو تاریفانەی قورئان، پێغەمبەرمانﷺ لەتاریفیداسەدان فەرمودەی فەرموە ئێمەش لێرەدا دوانیان دەنوسین، پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:{ **جَنَّتَانِ مِنْ فِضةٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَجَنَّتَانِ مِنْ ذَهَبٍ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلا رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ** / اري ومسلم/ دوو باخچەی زیو بە زەرفەکانیەوەو بەوەی کە تێیدایەو دوو باخچەی زێڕ بە زەرفەکانیەوەوبەوەی کە تێیدایە هیچ شتێك نابێت بەبەربەست لەنێوان ئەوخەڵکەو لەنێوان بینینی خودا بێجگە لە پەردەی (کیبریا)و ئەمەش هەموی لە باغچەی جێگیرو دانیشتندایە}

هەروەها دەفەرموێ:{ **إن لِلْمُؤْمِنِ فِي الجَنةِ لَخَيْمَةً مِنْ لُؤْلُؤَةٍ وَاحِدَةٍ مُجَوَّفَةٍ طُولُهَا سِتونَ مِيلًا لِلْمُؤْمِنِ فِيهَا أَهْلُونَ يَطُوفُ عَلَيْهِمْ الْمُؤْمِنُ فَلَا يَرَى بَعْضُهُمْ بَعْضًا** / اري ومسلم/ بەراستی لە بەهشتدا هەمو باوەڕدارێك چادرێکی هەیە کە لە یەك دانە مرواری ناو خاڵی دروستبوە کە درێژیەکەی شەست میلە، بۆ ئەو باوەڕدارە لەناو ئەو چادرەدا چەندین خێزان هەیەو بەسەریاندا ئەگەڕێت بەڵام ئەوەندە پانو گەورەیە ئەوان یەکتر نابینن} جا الله روی فەرمایشتی خۆی دەکاتە پێغەمبەر ﷺو دەفەرموێ:

(٧٣) ئەی پێغەمبەر جیهاد بکە دژی کافرانو مونافقانو زۆر توندو تیژبە لە سەر دژایەتیانو جێگاو شوێنی ئایندەی ئەوان دۆزەخەو ئەو شوێنە بۆ ئەوان پیسترین جێگایە، بەڵێ، پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ئەم فەرمانەی الله ی هەروەك باقی فەرمانەکانی تری بەچاکی جێ بەجێ کردوەو چەندین جەنگی گەورەو بچوکی دژی کافران کردوە بەڵام بەزمان دژی دووڕوەکان قسەی کردوەو نەیکوشتون تا دوژمنان پروپاگەندە لەدژی بڵاونەکەنەوەو بڵێن: محمد رەفیقەکانی خۆی دەکوژێتو بەو شێوەیە رێگا لە باوەڕهێنانی خەڵکی دورەدەست بگرنو بیانترسێنن لە رەفیقایەتی پێغەمبەرﷺ جاهەرکەس بەدەم بەباوەڕدار خۆی دەربخستایە ئیتر ئەمین دەبو لە گیانو ماڵی، پێغەمبەر ﷺ ئەگەر چی دەیناسین بەهۆی پێناسەی خوداوە بۆی بەڵام باری تانەو تەشەری ئەوانی هەڵدەگرت تا دوژمنان نەتوانن لەو کەلەبەرەوە بێنەناوو دەست بکەن بەترساندنی خەڵك یان کەسانی مونافق هەڵبسن بەکوشتنی کە سانێ کە خۆشیان ناوون بەناوی مونافقەوە، تەنانەت پێغەمبەرمانﷺ تورەبوە لە ئوسامەی کوڕی زەید کە زۆری خۆش دەویست لەسەر ئەوەی

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلْكُفَّارَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٣﴾ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ مَا قَالُوا۟ وَلَقَدْ قَالُوا۟ كَلِمَةَ ٱلْكُفْرِ وَكَفَرُوا۟ بَعْدَ إِسْلَٰمِهِمْ وَهَمُّوا۟ بِمَا لَمْ يَنَالُوا۟ ۚ وَمَا نَقَمُوٓا۟ إِلَّآ أَنْ أَغْنَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ مِن فَضْلِهِۦ ۚ فَإِن يَتُوبُوا۟ يَكُ خَيْرًا لَّهُمْ ۖ وَإِن يَتَوَلَّوْا۟ يُعَذِّبْهُمُ ٱللَّهُ عَذَابًا أَلِيمًا فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَمَا لَهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ مِن وَلِىٍّ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٧٤﴾ ۞ وَمِنْهُم مَّنْ عَٰهَدَ ٱللَّهَ لَئِنْ ءَاتَىٰنَا مِن فَضْلِهِۦ لَنَصَّدَّقَنَّ وَلَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّآ ءَاتَىٰهُم مِّن فَضْلِهِۦ بَخِلُوا۟ بِهِۦ وَتَوَلَّوا۟ وَّهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٧٦﴾ فَأَعْقَبَهُمْ نِفَاقًا فِى قُلُوبِهِمْ إِلَىٰ يَوْمِ يَلْقَوْنَهُۥ بِمَآ أَخْلَفُوا۟ ٱللَّهَ مَا وَعَدُوهُ وَبِمَا كَانُوا۟ يَكْذِبُونَ ﴿٧٧﴾ أَلَمْ يَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُمْ وَأَنَّ ٱللَّهَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿٧٨﴾ ٱلَّذِينَ يَلْمِزُونَ ٱلْمُطَّوِّعِينَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ فِى ٱلصَّدَقَٰتِ وَٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ إِلَّا جُهْدَهُمْ فَيَسْخَرُونَ مِنْهُمْ ۙ سَخِرَ ٱللَّهُ مِنْهُمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٩﴾

کەکاتێ کابرایەکی کافری توش هات وتی(**لا اله الا ا** ) بەڵام ئوسامە باوەڕی پێ نەکردو وتی: لە ترساوا ئەڵێتو کوشتی، ئەم باسە بەدرێژی لە سورەتی (**النساء**) ئایەتی نەوەدوچواردا باسکراوە. ئینجا خوا درێژە بەباسی دووڕوەکان دەداتو دەفەرموێ:

(٧٤) سوێند دەخۆن بە الله کە ئەوان ئەو قسەیان نەکردوە، وەخوایش بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: خۆ بەراستی ئەوان وشەی کوفریان وتو وەکافربوون بەئاشکرا پاش ئەوەی کە بەرواڵەت موسڵمان بوون، ئەوەی راستی بێ ئەمانە هەربە رواڵەت موسڵمان بوونو هەرگیز باوەڕی راستەقینەیان نەبوە، تەنها بۆ پاراستنی گیانو ماڵیان فرمانەکانی ئیسلامیان ئەنجام دەدا، ئینجا خوا دەفەرموێ: جا ئەوانە ویستیان پیلانێکی پڕمەترسی ئەنجام بدەن بەڵام پێی نەگەیشتن، ئەوەبو چەند نەفەرێك لەو دووڕوانە کاتێ پێغەمبەرﷺ لە تەبوك گەڕایەوە ویستیان لە پلەیەکدا لەسەر وشترەکەی هەوایدەن بەمەبەستی شەهیدکردنی بەڵام الله ئاگاداری کردەوە جاچەند کەسێکی پێشەکی ناردو لەو جێگادا دەریان کردن، خۆ ئەوان هیچ رقێکیان نەبو لە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنها ئەوەبو کە خواو پێغەمبەرەکەیﷺ ئەوانیان بێ نیاز کردبو لەو خەیرو بەرەکەتەی کە خوا رژاندی بەسەریاندا جا ئەوانە لەباتی شوکری خوداو رێزدانان بۆ پێغەمبەرەکەی کە بوە بەهۆی دەوڵەمەندبونیان کەوتنە رقەبەریو دژایەتی

ٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ أَوْ لَا تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ إِن تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ سَبْعِينَ مَرَّةً فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَـٰسِقِينَ ﴿٨٠﴾ فَرِحَ ٱلْمُخَلَّفُونَ بِمَقْعَدِهِمْ خِلَـٰفَ رَسُولِ ٱللَّهِ وَكَرِهُوٓا۟ أَن يُجَـٰهِدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَقَالُوا۟ لَا تَنفِرُوا۟ فِى ٱلْحَرِّ ۗ قُلْ نَارُ جَهَنَّمَ أَشَدُّ حَرًّا ۚ لَّوْ كَانُوا۟ يَفْقَهُونَ ﴿٨١﴾ فَلْيَضْحَكُوا۟ قَلِيلًا وَلْيَبْكُوا۟ كَثِيرًا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَإِن رَّجَعَكَ ٱللَّهُ إِلَىٰ طَآئِفَةٍ مِّنْهُمْ فَٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِلْخُرُوجِ فَقُل لَّن تَخْرُجُوا۟ مَعِىَ أَبَدًا وَلَن تُقَـٰتِلُوا۟ مَعِىَ عَدُوًّا ۖ إِنَّكُمْ رَضِيتُم بِٱلْقُعُودِ أَوَّلَ مَرَّةٍ فَٱقْعُدُوا۟ مَعَ ٱلْخَـٰلِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ ۖ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ وَلَا تُعْجِبْكَ أَمْوَٰلُهُمْ وَأَوْلَـٰدُهُمْ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُعَذِّبَهُم بِهَا فِى ٱلدُّنْيَا وَتَزْهَقَ أَنفُسُهُمْ وَهُمْ كَـٰفِرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَجَـٰهِدُوا۟ مَعَ رَسُولِهِ ٱسْتَـْٔذَنَكَ أُو۟لُوا۟ ٱلطَّوْلِ مِنْهُمْ وَقَالُوا۟ ذَرْنَا نَكُن مَّعَ ٱلْقَـٰعِدِينَ ﴿٨٦﴾

پێغەمبەرﷺ سەرەڕای ئەوەش خوا دەفەرموێ: ئەوسا ئەگەر ئەوان تەوبەبکەن‌و واز لە دژایەتی ئایین‌و پێغەمبەر بهێنن ئەوە چاکە بۆیان، وەئەگەر تۆبەنەکەن‌و هەر پشت لە ئایین بکەن ﷲ سزایان دەدات بەسزایەکی دەردناك لە دنیاو لە قیامەت دا واتە لە دنیادا سەرشۆڕو بێ قیمەت‌و زەلیلیان دەکات‌و لە ڕۆژی دواییشدا دەیانخاتە دۆزەخەوە ئەوسا لەم سەرزەویەدا هیچ دۆست‌و یارمەتی دەرێکیان نیە.

ئینجا باسی ئەو کەسانە دەکات کە کەم دەست‌و نیازمەندن‌و بەلێنی توندو بەهێز دەدەن بەخوا ئەگەر دەوڵەمەندببین لەخەیرو چاکە نەوەستین بەلاّم وەختێ خوا نیعمەتی خۆی دەڕژێنێ بەسەریاندا بەلێنەکەیان لەبیر دەچێتەوەو دەفەرموێ:

﴿٧٥﴾ هەر لە ناو ئەواندا کەسانێك هەن کە پەیمانیان داوە بەخوا کە ئەگەر خوا نیعمەتی پێدان چاکەبکەن‌و لە ریزی پیاو چاکاندابن.

﴿٧٦﴾ کەچی کاتێ خوا نیعمەتی رژاند بەسەریانداو سەروەت‌و سامانیان زۆربو رژدیان کردو هیچ زەخەیرو چاکەیەکیان لێ نەکردو پشتیان کردە ئایین‌و هەروا لەسەر ئەو پشت تێکردنەش بەردەوام بوون،

﴿٧٧﴾ جا بەو هۆیەوە خوا داینا لەناو دڵەکانیاندا مونافقی‌و لەسەری مانەوە تا ڕۆژی قیامەت، ئەوەش ئەوەنەبێ کە خوا ستەمی لێکردبن بەڵکو بەهۆی ئەوەی کە پاشگەزبوونەوە لەو بەلێنەی کە بە خوایان دابوو وەبەهۆی ئەوەی کە درۆیان کردبو، واتە بەلێن شکان‌و درۆکردن ئەوەندە پڕمەترسیە پێویستە باوەڕداران ئاگایان لە خۆیان بێت‌و ئەم دوو خوە ناپەسەندەیان تێدا بەدی نەکرێت ئەوەتە پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی:{ **آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ** / اري/ نیشانەی مونافق سێ شتە، هەرکاتێ قسەی کرد درۆدەکات. هەرکاتێ بەلێنێکی دا نایباتە سەر. هەرکاتێ ئەمانەتێکی پێ سپێررا خیانەتی تێدا دەکات}

ئینجا ﷲ هەڕەشە لە مونافقان دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٧٨﴾ ئایا ئەوان نازانن‌و دڵنیانین کە بێگومان ﷲ ئاگای لە شتەشاراوەکانی ناو دڵیانەوئاگای لە چپەکانیانەو بێگومان کە ﷲ زانەری هەمو شتە شاراوەکانەو هیچ شتێك لەو حەشار نادرێت، ئینجا ﷲ باسی سیفەتێکی تری ئەو مونافقانە دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٧٩﴾ ئەوکەسانەی کە گاڵتەیان ئەکرد بەو موسڵمانانەی کەلە خۆیانەوە چاکەیان ئەکرد ئەگەر زۆریان ببەخشایە ئەیان وت: ئەوانە ریابازن‌و بۆ خۆهەڵنان لەبەرچاوی خەڵك ئەوەندە شت دەبەخشن‌و ئەو کەسانەی کە هیچیان دەست نەدەکەوت مەگەر خۆیان نەبێت ئیشێکیان بکردایە جا ئیتر هەرچییان دەر بهێنایە ئەیانهێنایە خزمەتی پێغەمبەرﷺ جا ئەوان گاڵتەیان بەوانیش دەکردو دەیان وت: ئەو شتە کەمە چیەوخوا چ نیازێکی بەوە هەیە، واتە هیچ ئیشێکی موسڵمانیان بەچاك دانەدەنا؟! جا بەهۆی ئەو هەمو رەفتارو قسە ناشرینانەوە ﷲ تورەبو لێیان‌و فەرموی: ﷲ گاڵتە بەوان دەکات‌و بەکەمیان دەزانێت، وەبۆ ئەوان هەیە سزایەکی دەردناك، ئینجا دەفەرموێ:

﴿٨٠﴾ ئەگەر تۆ داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکەیت یان نەیکەیت ئەی محمد یەکسانە لای ئێمە، ئەگەر تۆ حەفتا جاریش داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکەیت دڵنیابە کە خوا لێیان خۆش نابێت. بۆچی خوا لێیان خۆش نابێت؟ چونکە ئەوان بێ باوەڕبوون بەخواو بە پێغەمبەرەکەیﷺ وخودا یش کۆمەڵی فاسقان ناخاتە سەر رێگای راست‌و رێنماییان ناکات.لەفەرمودەدا هاتوە کەکاتێ عەبدوڵای کوڕی ئوبەی مرد عەبدوڵای کوڕی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ کە کراسەکەی خۆی بداتێ کەبیکات بەکفنی باوکی جا ئەویش کراسەکەی پێدا وئینجا داوای لێکرد کە نوێژی لەسەر بکات جا پێغە مبەر هەستا کە نوێژی لەسەر بکات ئەوسا عومەر هەستاولیباسی پێغەمبەری خوایﷺ گرت‌و وتی: ئایا نوێژدەکەی لەسەری کە خوا رێی پێ نەداوی کە نوێژی لەسەر بکەیت؟!

پێغەمبەری خواﷺ فەرموی:{ إنمَا خَيرَنِي اللهُ فقَالَ اسْتَغفِرْ لَهُمْ أوْ لَا تَسْتَغفِرْ لَهُمْ إنْ تَسْتَغفِرْ لَهُم سَبْعِ مرةً وَسَأزِيدُ عَلى سَبْعِ قَالَ إنهُ مُنَافِقٌ فَصَلي عَلَيهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأنزَلَ اللهُ عَز وَجَل وَلَا تُصَل عَلى أحَدٍ مِنهُمْ مَاتَ أبدًا وَلَا تَقُمْ عَلى قَبرِهِ ـ وَزَادَ روايةـ فَتَرَكَ الصلَاةَ عَلَيهِمْ/ متفق عليه/ ﷻ منی سەر پشك كردوە كەفەرمويەتی: داوای لێ خۆشبونیان بۆ بكەیت یان نەیكەیت ئەگەر حەفتا جاریش داوای لێ خۆشبونیان بۆبكەیت، خۆمن لە حەفتایش زیاتری دەكەم. عومەر وتی: ئەوە مونافقە، جا پێغەمبەرﷺ نوێژی لەسەركردوﷻ ی بەدەسەڵاتو گەورە ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿ وَلَا تُصَلِّ عَلَىٰٓ أَحَدٍ مِّنْهُم مَّاتَ أَبَدًا وَلَا تَقُمْ عَلَىٰ قَبْرِهِۦٓ إِنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ فَـٰسِقُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾/ التوبة: ٨٤ / لەریوایەتی ترداهاتوەو ئەمەی لێ زیادكردوە جائیتر نوێژی لەسەر نەكردن. ئەڵێن عومەر"خوا لێی رازی بێت" لەپاش وەفاتی پێغەمبەرﷺ نوێژی نەدەكرد لەسەر هیچ جەنازەیەك تا چاوی بە حوزەیفەی یەمان نەكەوتایە كە نوێژی لەسەر دەكات چونكە حوزەیفە تەواوی مونافقانی دەناسیو پێغەمبەرﷺ بەوی فەرموبو بۆیە بە حوزەیفە دەوترا (صاحب السر/خاوەنی نهێنی). ئینجا خوای داناو ئاگادار لە هەمو شتێك، سەركۆنەی ئەو مونافقانە دەكات كەلە جەنگی تەبوك دا لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ دەرنەچوونو دەفەرموێ:

﴿٨١﴾ دواكەوتوەكان شادمانن بەدانیشتنیان لەماڵداو نەڕۆیشتنیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ وپێیان ناخۆش بو جیهاد بكەن بەماڵوبە گیانیان لە رێگای ﷲ داودەیان وت: دەرمەچن لەم كاتە گەرمەدا كەهاوینە، ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئاگری دۆزەخ زۆر زۆر گەرمترە لەو گەرمیەی كە ئەوان لێی دەترسن ئەگەر ئەوان ئەهلی دەرك بونایە بەڵام چونكە نەزان بون ئەو گەرمای هاوینەیان لەلا لە هەموشت سەخت تربو، ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرەوەﷺ هێناویەتی كە فەرمویەتی:{ إن نَارَكُمْ هَذِهِ جُزْءٌ مِنْ سَبْعِ جُزْءًا مِنْ نَارِ جَهَنمَ وَضُرِبَتْ بِالبَحْرِ مرتَينِ وَلَوْلَا ذَلِكَ مَا جَعَلَ اللهُ فِيهَا مَنفَعَةً لِأحَدٍ /امام ا د: صحيح/ بەراستی ئەم ئاگرەتان بەشێكە لە حەفتا بەشی ئاگری دۆزەخو دوجاریش دراوە لەدەریا، وەئەگەر وای لێ نەكرایە خوا هیچ سودێكی بۆكەس دانەدەنا لەو ئاگرە} كەوابو ئاگری دۆزەخ زۆرزۆر گەرمترە لەگەرمای هاوینی عەربستان، جا ئەگەر زاناو ژیر بونایە دەچون بۆ ئەو غەزا لەو كاتە گەرمەدا تالەو ئاگرە زۆرزۆر گەرمەی قیامەت رزگاریان ببوایە بەراستی ئەوان وەكو ئەوكەسەیان كردوە كەلە ترسی بەردی گەرم خۆی فڕەبداتە ناو ئاگر، ئینجا زیاتر هەڕەشە لەو مونافقانەو وێنەكانیان دەكاتو دەفەرموێ:

﴿٨٢﴾ باكەمێ لەم دنیادا پێ بكەنن بەو ئیشە ناپەسەندەی خۆیانو ڕابوێرن، جا كاتێ لەدنیادا دەرچون دەی ئیتر بادەست بكەن بە گریانو شیوەنو هەر نەیبڕنەوە، بەڵێ ئەبێ بەزۆری بگرین چونكە هیچ چاكەیەكی وایان نەكردوە كەلە پاش مەرگ بگاتە فریایان كە ئەمەش تۆڵەی خۆیانە بەهۆی ئەو ئیشە خراپانەی كە كردویانن، ئینجا ﷲ بە رونترین شێوە بێزاری خۆی لەو مونافقانە دەر دەبڕێتو دەفەرموێ:

﴿٨٣﴾ ئەی محمد ئەگەر تۆ گەڕایتەوە بۆ مەدینەو بۆلای كۆمەڵێ لەو مونافقانەو جارێكی تر دەرچویت بۆ جەنگو جیهاد ئەوان داوا دەكەن لە تۆ كە ماوەیان بدەیت بۆ دەرچون بۆ جیهاد جا تۆش پێیان بڵێ: ئیتر هەرگیز نابێ لەگەڵ مندا دەربچن بۆ جیهادو هەرگیز نابێ لەگەڵ مندا دژی هیچ دوژمنێك جەنگ بكەن، چونكە بەبێگومان ئێوە یەكەم جارڕازی بوون بەدانیشتنو بە گوێی منتان نەكردو دەرنەچون بۆ جیهاد سا ئێستاش دانیشن لەگەڵ منداڵو پیرو پەك كەوتوو ژناندا، دیسان ﷲ بە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:

﴿٨٤﴾ هەرگیز نوێژی مردوو نەكەیت لەسەر هیچ كەس لەوان كە مردنو نەچیتە سەر گۆڕەكەیشی واتە بەهیچ شێوەیەك ئیشێك نەكەیت كەمانای رێزو نرخی تێدا بێ بۆ ئەو مونافقانە، بۆ؟ چونكە بەبێشك كەئەوان بێ باوەڕبون بەخواو بەپێغەمبەرەكەیﷺ وەئەوانە گیاندەرچونیان لەحاڵێكدا بوە كە لە سنوری ئایینی خوا دەرچون.

﴿٨٥﴾ جا بازۆری ماڵو منداڵی ئەو كافرانە وات لێ نەكات كە سەرت سوڕبمێنێو بە شتێكی گرنگی بزانی ئارەزۆی خوا لەسەر ئەو سەروەتو سامانو منداڵ پێدانەی كافران بێجگەلەوەی كەئەیەوێ بەو ماڵو منداڵە سزایان بدات لەدنیاداو گیانیان دەربچێت بەبێ باوەڕیو كافری شتێكی ترنیە. جا بۆسوودی زیاتربگەرێرەوە بۆمانای ئایەتی پەنجاوپێنج، ئینجا خوا دیسان ئەگەڕێتەوە سەر لۆمەو سەرزەنشتی مونافقانو دەفەرموێ:

﴿٨٦﴾ هەركاتێك سورەتێك رەوانە بكرایەو بیفەرموایە باوەڕ بهێنن بەخواو لەگەڵ پێغەمبەركەیدا دەرچن بۆ جیهاد ئەوانەی كەدەسەڵات داربوون داوایان دەكرد لە تۆ ئەی محمدﷺ كە ماوەیان پێ بدەیتو دەرنەچن بۆ جیهادو دەیان وت: وازمان لێ بهێنە با لەگەڵ ئەو خەڵكەی كە دانیشتون دابنیشین، خوایش دەفەرموێ:

رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ ﴿٨٧﴾ لَـٰكِنِ ٱلرَّسُولُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ جَـٰهَدُوا۟ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْخَيْرَٰتُ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٨٨﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ ذَٰلِكَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٨٩﴾ وَجَآءَ ٱلْمُعَذِّرُونَ مِنَ ٱلْأَعْرَابِ لِيُؤْذَنَ لَهُمْ وَقَعَدَ ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ۚ سَيُصِيبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٩٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلضُّعَفَآءِ وَلَا عَلَى ٱلْمَرْضَىٰ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا۟ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ مَا عَلَى ٱلْمُحْسِنِينَ مِن سَبِيلٍ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٩١﴾ وَلَا عَلَى ٱلَّذِينَ إِذَا مَآ أَتَوْكَ لِتَحْمِلَهُمْ قُلْتَ لَآ أَجِدُ مَآ أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ تَوَلَّوا۟ وَّأَعْيُنُهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ حَزَنًا أَلَّا يَجِدُوا۟ مَا يُنفِقُونَ ﴿٩٢﴾ ۞ إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ وَهُمْ أَغْنِيَآءُ ۚ رَضُوا۟ بِأَن يَكُونُوا۟ مَعَ ٱلْخَوَالِفِ وَطَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٩٣﴾

**﴿٨٧﴾** ئەوان رازی بون کە لەگەڵ ئافرەتاندا دابنیشن‌ونەچن بۆ غەزاو وەك خێزانەکانی خۆیان لە ماڵەوە بمێننەوە، وەلە حاڵێکدا کەمۆر نرابو بەسەر دڵیانداو ئێستاش ئەوان دەرکی هیچ ناکەن.

وشەی (ٱلْخَوَالِفِ) کۆی(خَالِفَة)یە واتە ئافرەتانی دانیشتو، بەڵێ ئەمان لەبیرو باوەڕەکەیاندا راستیان نەکردوەو تەنها بۆ فێڵکردن لە باوەڕدارانو پاراستنی گیانو ماڵیان ئەو ئیشە بەرواڵەتە ئیسلامیانەیان ئەنجام داوە، ئینجا خوا سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺو خاوەن باوەڕان دەفەرموێ:

**﴿٨٨﴾** بەڵام پێغەمبەرﷺ و ئەو کەسانەی باوەڕیان هێنابو لەگەڵ ئەودا جیهادیان دەکرد بەماڵو گیانیانو لە هیچ کۆسپێك سڵیان نەدەکردو بۆ ئەوانە هەیە هەمو چاکەیەك و هەرئەوانەن کە خۆشبەختو رزگارن.

**﴿٨٩﴾** سەرەڕای ئەوەش ﷲ ئامادەی کردوە بۆ ئەوان چەندین باخچە کە بە ژێریاندا چەندین جۆگا دەڕواتو بۆ هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە بەراستی ئەوەیە بەهرەو خۆشبەختی گەورە، جارێکی تر درۆزنیو ناپاکی ئەو مونافقانە باس دەکاتەوەو دەفەرموێ:

**﴿٩٠﴾** کاتێك کە پێغەمبەرﷺ ئامادەی رۆیشتن بو بۆ "تەبوك" ئەوانەی کە بیانویەکی شەرعییان هەبو لە نەچون بۆ غەزا هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ تاماوەیان پێ بدات کەنەچن بۆ جیهاد، وەئەوانەی کە درۆیان کرد لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی ﷺدا بەباوەڕهێنانی رواڵەتی، دانیشتنو نەهاتنە خزمەتی پێغەمبەریش، جا خوا هەڕەشە لەوکەسانە دەکاتو دەفەرموێ: بەم زوانە ئەوانەی کەلەوان بێ باوەڕبون دوچاری سزایەکی سەخت دەبن، ئینجا خوا سەبارەت بەو کەسانەی کەبەراستی توانایان نەبو بچن بۆ جیهاد دەفەرموێ:

**﴿٩١﴾** لەسەر مرۆڤە لاوازو پەك کەوتوەکانو لەسەر ئەوکەسانەی کە نەخۆشنو لەسەر ئەوکەسانەی کە هیچیان نیە کە بیبەخشن هیچ تاوانێك نیە بەومەرجەی کە راست بکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیداﷺ و بەگوێی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەر ﷺ بکەن جا ئەوانەی کە ئاوابن ئەوانە چاکەکارنو لەسەر ئەو چاکەکارانەیش هیچ تاوانێك نیەو بۆئەو دواکەوتنەیان سەرزەنشت ناکرێنو ﷲ زۆر لێ خۆشبوو زۆربە سۆزەو لە تاوانی چاکەکاران چاوپۆشی دەکاتو بەزەیی دێتەوەپێیاندا. هەروەها دەفەرموێ:

**﴿٩٢﴾** ئەوسا هیچ تاوانێکیش نیەلەسەر ئەوکەسانەش کەهاتنەلای تۆو ئامادەی دەرچون ببونو وتیان: وڵاخی سواریمان پێ بدەو تۆ وتت: هیچم نییە کە ئێوەی پێ هەڵگرمو ئەوانیش گەڕانەوە لەحاڵێکدا کە چاوەکانیان فرمێسکی پێدا دەهاتە خوارەوە لە خەمی ئەوەی کە هیچیان نەبو کە بیبەخشن.

**﴿٩٣﴾** بەڵکو گوناهو تاوان لەسەر ئەوانە دەنوسرێت کەداوای ئیزن لە تۆ دەکەن لەهەڵو مەرجێکدا کەئەوان دەوڵەمەندن و دەسەڵاتی ئەوسەفەرەیان هەیە بەڵام رازین لەگەڵ ئافرەتاندا لەماڵەوە بمێننەوەو جیهاد نەکەن، جا بەوهۆیەوە ﷲ مۆری نا بەسەر دڵەکانیاندا جائەوان بەخۆیان نازانن. ئینجا خوای باڵادەست ناڕەزای خۆی سەبارەت بەم جۆرە مرۆڤانە نیشان دەداتو دەفەرموێ:

**﴿٩٤﴾** ئەمانە هەرکاتێك گەڕایتەوە لایان بەهانەتان بۆ دەهێننەوە تا چاو پۆشیان لێ بکەیتو دوعای خێریان بۆ بکەیت تاله ناو موسڵماناندا سەرشۆڕ نەبن، بەڵام نابێ ئێوە بەقسەی ئەوان باوەڕبکەن بەڵکو پێویستە بەچاکی تەریقیان بکەیتەوەوبڵێ: بەهانە مەهێننەوە، چونکە هەرگیز باوەڕتان پێ ناکەین، بۆ؟ چونکە ﷲ هەواڵی ئێوەی پێداوین کە ناراستو درۆزنن، وەبەم زوانە ﷲ تەماشای کردارەکانی ئێوە دەکات چونکە کردار ئاشکراکەری راستیو ناراستی مرۆڤە هەروەها پێغەمبەرکەیشیﷺ، لە پاش دا ئێوە ئەگەڕێنرێنەوە بۆلای ئەو

زاتەی کە زانەری پەنامەکیو ئاشکرایە وەکویەك، جا پاداشی کردارو هەڵوێستەکانتان بەهۆی ئەو شتە پیسانەوە کە دەیکەن پێ دەدات، دیسان خوا درێژە بەرۆشنکردنەوەی رەوشتی دووڕو موونافقەکان دەداتو دەفەرموێ:

(٩٥) ئەمانە لەمەولا سوێند دەخۆن بۆتان کاتێك کە گەڕانەوە بۆلایان، بۆ؟ بۆئەوەی کە ئێوە وازیان لێ بهێننو لۆمەیان نەکەن دەی ئێوەش پشتیان تێبکەن، بەبێشك ئەوان پیسن و شوێنی ئەوان دۆزەخەو ئەمەش تۆڵەیەکە بەهۆی ئەو ئیشە خراپانەوەیە کە دەیکەن.

(٩٦) ئەوان سوێندتان بۆدەخۆن تا ئێوە رازی بن لێیان جابەراستی ئەگەر ئێوەش ئەی موسڵمانان لێیان ڕازی ببن ئەوان هیچ سودێکیان دەست ناکەوێت، بۆ؟ چونکە بەبێگومان ﷲ رازی نابێت لەو گەلە فاسقانە. لەم ئایەتەوە دەردەکەوێت کە موونافقان دۆزینەوەیان سەختەو چاك وایە هەربەهانەیەك باسکرا بۆ خۆدزینەوە لە دەرچون بۆ جیهاد وەرگیرێتو سزایان بدرێتە دەست خوا لە پاشە رۆژداو با بە چاکیش بزانن کەلە دەست خوا دەرناچن، ئینجا خوا عەرەبە دەشتەکیەکانی کردوە بەسێ بەشەوە سەبارەت بەبەشی یەکەمیان دەفەرموێ:

(٩٧) هەندێك لەو عەرەبە دەشتەکیانە زۆرزۆر توندن لە سەر کوفرو موونافقی، جالەبەر ئەو دوو رەوشتە ناپەسەندەیان ئەوان شایستەترن کە تێ نەگەنو حاڵی نەبن لەو سنورانەی کەﷲ رەوانەی کردوەتە سەر پێغەمبەرەکەیﷺ وە ﷲ زانایەو ئاگای لە دڵو دەرونی هەمو مرۆڤێك هەیەو دانایەو هەمو کارو بارەکانی لە جێگای خۆیدایە. جالە بارەی بەشی دوهەمیانەوە دەفەرموێ:

(٩٨) جاهەندێکی تر لەو دەشتەکیانە کەسانێکن کە ئەوەی دەیبەخشن بەجەریمەی دەزاننو ئەگەر ناچار نەبن هیچ شتێك نابەخشنو چاوەڕوانی رۆژانی رەشن بۆتان تا تۆڵەی خۆیان وەرگرنەوە، جا خوا دڵنەوایی موسڵمانان دەکاتو بەردی گەرم دەدات بە ناسۆری ئەو جۆرە بێ باوەڕانەداو دەفەرموێ: بابزانن هەمیشە رۆژانی رەش هەر بەسەر ئەواندا دەسوڕێتەوەو ﷲ بیسەری هەمو قسەو بڕیاریانەو زانەری هەمو هەڵسو کەوتیانە. ئەم دوو بەشەی دەشتەکییەکان زۆر خراپو ناپەسەندنو هەمیشە ئەبێ چاوەڕوانی سزاو رۆژی رەش بکەن بۆ خۆیان، بەڵام بەبەشی سێهەمیان دەفەرموێ:

يَعۡتَذِرُونَ إِلَيۡكُمۡ إِذَا رَجَعۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡۚ قُل لَّا تَعۡتَذِرُواْ لَن نُّؤۡمِنَ لَكُمۡ قَدۡ نَبَّأَنَا ٱللَّهُ مِنۡ أَخۡبَارِكُمۡۚ وَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٤﴾ سَيَحۡلِفُونَ بِٱللَّهِ لَكُمۡ إِذَا ٱنقَلَبۡتُمۡ إِلَيۡهِمۡ لِتُعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ فَأَعۡرِضُواْ عَنۡهُمۡۖ إِنَّهُمۡ رِجۡسٞۖ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٩٥﴾ يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ لِتَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡۖ فَإِن تَرۡضَوۡاْ عَنۡهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَرۡضَىٰ عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٩٦﴾ ٱلۡأَعۡرَابُ أَشَدُّ كُفۡرٗا وَنِفَاقٗا وَأَجۡدَرُ أَلَّا يَعۡلَمُواْ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٩٧﴾ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ مَغۡرَمٗا وَيَتَرَبَّصُ بِكُمُ ٱلدَّوَآئِرَۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٩٨﴾ وَمِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَيَتَّخِذُ مَا يُنفِقُ قُرُبَٰتٍ عِندَ ٱللَّهِ وَصَلَوَٰتِ ٱلرَّسُولِۚ أَلَآ إِنَّهَا قُرۡبَةٞ لَّهُمۡۚ سَيُدۡخِلُهُمُ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٩﴾

(٩٩) ئەوسا بەشێکی تر لەو عەرەبە دەشتەکیانە باوەڕ بەخواو بە رۆژی دوایی دەهێنیو ئەوەی کە دەیبەخشێت دەیکات بەهۆی نزیك بوونەوە لە خواو دوعاو نزای پێغەمبەرەکەیﷺ چونکە ئەو دوعاو نزایە بوەتە هۆی دڵخۆشیو ئارام گرتنیان، جا ﷲ دەفەرموێ: ئاگاداربن بەراستی ئەو ماڵەی کە دەیبەخشن ئەبێتە هۆی نزیکیان لە خواوە کە بەم زوانەش خوا دەیان خاتە ناو رەحمەتی خۆیو پاداشتی ئەونیەتو کردارە جوانانەیان پێ دەداتەوە کە بە بێگومان ﷲ زۆر لێ خۆشبوە لەتاوانو زۆر بەبەزەییو بەسۆزە. دەڵێن: کۆمەڵێك لەو عەرەبە دەشتەکیانە هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتیان: ئایە ئێوە منالّتان ماچ دەکەن؟ وتیان بەڵێ. ئەوانیش وتیان: بەخوا ئێمە ماچیان ناکەین، پێغەمبەریشﷺ فەرموی:{ أَوَامِلكُ اِن كَانَ ا ُ نَزَعَ مِنكُمُ الرَّ َةَ؟!/متفق عليه / ئایا من دەسەڵاتم چیەچی کە خوا رەحمو بەزەیی لە ناو دڵی ئێوەدا لابردوە؟}

واتە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو جۆرە هەڵوێستەی ئەوانی بەخراپ دانا، چونکە بەزەییو میهرەبانی دوو سیفەتی گەورەی خودان ئەوەتە بەندە هەرچەندە تاوانو خراپە بکات مادام پەشیمان ببێتەوە خوا چاو پۆشی لێ دەکات چونکە خاوەنی سۆزو میهرەبانیە. ئینجا هەروەکو عەرەبە دەشتەکییەکان کران بەسێ بەشەوەو پێ ناسەکران خوا خەڵکی باوەڕداریشی کردوە بە سێ

وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلۡأَوَّلُونَ مِنَ ٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ وَٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُم بِإِحۡسَٰنٖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي تَحۡتَهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١٠٠﴾ وَمِمَّنۡ حَوۡلَكُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ مُنَٰفِقُونَۖ وَمِنۡ أَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ مَرَدُواْ عَلَى ٱلنِّفَاقِ لَا تَعۡلَمُهُمۡۖ نَحۡنُ نَعۡلَمُهُمۡۚ سَنُعَذِّبُهُم مَّرَّتَيۡنِ ثُمَّ يُرَدُّونَ إِلَىٰ عَذَابٍ عَظِيمٖ ﴿١٠١﴾ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا عَسَى ٱللَّهُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠٢﴾ خُذۡ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡ صَدَقَةٗ تُطَهِّرُهُمۡ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٞ لَّهُمۡۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٠٣﴾ أَلَمۡ يَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَأۡخُذُ ٱلصَّدَقَٰتِ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ وَقُلِ ٱعۡمَلُواْ فَسَيَرَى ٱللَّهُ عَمَلَكُمۡ وَرَسُولُهُۥ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۖ وَسَتُرَدُّونَ إِلَىٰ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ وَءَاخَرُونَ مُرۡجَوۡنَ لِأَمۡرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمۡ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيۡهِمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿١٠٦﴾

بەشەوەو بێجگە لەو سێ بەشە کەسی تر بە باوەڕدار دانانرێت هەرچەند لاف بیر باوەڕو خواناسی لێ بدات، ئەو سێ بەشەش ئەمانەن کە ألله دەفەرموێ:

(١٠٠) ئەوسا ئەوانەی کەلە پێشەوە باوەڕیان هێناوە لە کۆچەری‌و یارمەتی دەر، کۆچەری ئەو موسڵمانانە بون کە بە فەرمانی پێغەمبەرمانﷺ کۆچیان کرد بۆ مەدینەو یارمەتی دەریش ئەوانەی مەدینەبون کە بون بە پاڵپشتو یارمەتی دەری پێغەمبەروﷺ کۆچەرییەکان، کە ئەم دووانە بەگشتی بەرزترین‌و بەوەفاترین باوەڕدارن لە سەر زەویداو باوەڕداری تر نیە لەم ئوممەتەی پێغەمبەردا ﷺ لەودووانە بەڕێزتروچاکتر بێت، خۆ هەرئەو دووانەش بون کە بون بەیەکەم بەردی بناغەی ئایینی پاکی ئیسلامو‌ئەگەر ئەوان نەبونایە ئەم ئیسلامە نەدەگەیشتە ئێمە جاپێویستەو ئەرکی سەرشانی هەمو باوەڕدارێکی ڕاستەقینەیە، کە ڕێزیان لێ بگرێت بۆیە ﷲ تاقمی سێهەم بەم شێوە باس دەکاتو دەفەرموێ: وەئەوکەسانەی کە تابیعی ئەوانن بە چاکە کە ﷲ لە وان ڕازییەو ئەوانیش ڕازیین لەفەرمان‌وپاساکانی ئەوزاتەو لەو نیعمەتانەی کە پێی داوون‌و ئامادەی کردوە بۆیان چەندین باخچە کە چەندین جۆگایان بەناودا دەڕواتو بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو هەرگیز لە ناویدا دەرناچن جابەڕاستی ئەوەیە بەهرەی زۆر گەورە. لەم ئایەتەوە دەر دەکەوێت کەهەرکەسێك دژایەتی یارەکانی پێغەمبەرﷺ بکات بەر ڕق‌و غەزەبی خوا دەکەوێت چونکەدژایەتی ڕاستەوخۆی سەرچاوەی ئیسلامە جاوای بەحاڵی شیعە کە دژایەتی چاکترین‌و بەڕێزترین یارەکانی پێغەمبەرﷺ دەکەن‌و ئاشکرایشە ئەوان بەر هیچکام لەو سێ کۆمەڵە ناکەون کە خوا ڕازییە لێیان چونکە نەکۆچەرین‌و نەیارمەتی دەرن‌و نەپەیڕەوی کەری ئەوانیش بە چاکە بەڵکو دژایەتیان دەکەن‌و شەوڕۆژ نەفرینیان لێ دەکەن؟! خوا لەناویان ببات‌وسەرشۆڕی هەردوو دنیایان بکات. ئینجا ﷲ بۆ وریا بوونەوەی خاوەن باوەڕان‌و ئاگاداربونیان لە فێڵ‌و تەڵەکەی بێ باوەڕو دووڕوەکان، ڕوودەکاتەوە باوەڕداران‌و دەفەرموێ:

(١٠١) جا هەندێك لەوانەی کەلە چواردەوری شاری مەدینەدان لەعەرەبە دەشتەکییەکان مونافقن، بیان ناسن‌و ئاگاداری فرو فێڵیان بن‌و هەندێکیش لە خەڵکی مەدینە وەکو عەبدوڵای کوڕی ئوبەی کە بە مونافقیەوە خوییان گرتوە کە تۆ نایان ناسی ئەی محمدﷺ ئێمە دەیان ناسین کەبەم زوانە دووجار گرفتاری سزایان دەکەین دەگونجێ هەر بەمانای دووجار بێ‌و مەبەست سزای دنیاو قیامەت بێ‌و دەشگونجێ کەمەبەست دووبارە بونەوەی سزابێ بۆ جار لە دوای جار هەرلە دنیادا وەك سوك تەماشاکردنیان‌و ئاشکرابونی ناراستیان‌و ناساندنیان بە پێغەمبەرﷺ و ڕوخاندنی بەناو مزگەوتەکەیان‌و دەیان شەرمەندەیی تریان هەر لە دنیادا، ئینجاﷲ دەفەرموێ: لەپاشا بەرەو سزایەکی گەورە دەبرێنەوە کە سزای قیامەتەو سەختی‌و ناخۆشی‌و تاڵی ئەوسزایە مەگەر هەرخوا خۆی بزانێت، جا پاش ئەوەی کە باسی مونافقانی بۆ کردین وا باسی ئەو باوەڕدارانە دەکات کەبە هۆی تەمەڵییەوە نەچون بۆ جیهادو دانیان بە تاوانی خۆیاندا ناوەو دەفەرموێ:

(١٠٢) خۆ هەندێکی تر هەن کە دانیان ناوە بەتاوانەکانی خۆیانداو ئیشی چاك‌و خراپیان تێکەڵاو کردوەو پەشیمانن لە تاوانەکانیان بۆ ئەمانە وا چاوەڕێ دەکرێت کە خوا پەشیمان بونەوەکەیان لێ وەرگرێت بێگومان کە ﷲ زۆرلێخۆش بو بەسۆزە بۆ بەندەکانی. بەڵێ باوەڕدارانی ڕاستەقینە ئەگەر شەیتان‌و نەفس بیانخەڵەتێنێت‌و تاوانێك بکەن زووبیر دەکەنەوەو پەشیمان دەبنەوە، خوایش بە لوتفی خۆی چاو پۆشیان لێ دەکات، ئینجا دەفەرموێ:

(١٠٣) زەکات‌و خێرو چاکەیان لێ وەربگرە، چونکە ئەو زەکات وەر گرتنە لەوان دەبێ بەهۆی ئەوە کە پاکیان بکاتەوە لە تاوان‌و خراپەو بەوزەکاتە خەیرو چاکەو تەلاشی چاکیان زیاتر بکات، وە دوعای خەیریان بۆ بکە چونکە بە بێگومان ئەو دوعایەی تۆ دڵیان خۆش دەکات‌و ئارامییان پێ دەدات، وەخوا بیسەرو زانایە بە وتارو کردارتان. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٠٤) ئایا نازانن کە خوا تەوبە لە بەندەکانی خۆی وەردەگرێت ئەگەر بەراستی تەوبە بکەنو بگەڕێنەوە بۆلای؟ وە زەکاتو خێر وەردەگرێ لەگەڵ ئەوەیشدا کە خوا نیازی بە هیچ شتو هیچ کەس نییە بەڵکو بنیادەم موحتاجو نیازمەندە بەخواو هەرچی چاکە بکات بۆ خۆیەتی چونکەچەندین بەرانبەر خوا پاداشتی ئەداتەوە، وە بێگومان کەﷻ هەرخۆیەتی زۆر تەوبە وەرگرەو زۆربەرحمەو بەسۆزە واتە تەوبە وەرگرتنو بەزەیی هاتنەوە بەخەڵك دوو سیفەتی خودانو لێی جیانابنەوە بەراستی مایەی هیواو ئومێدی بەندەی خودان چونکە خوای میهرەبانو بەسۆز لە تەوبەکردنی بەندەی خۆی بێزار نابێ ئەگەر لە رۆژێکدا سەدان جارتەوبەبکات، ئینجا خوا ئەفەرموێ:

(١٠٥) ئەی محمد پێیان بڵێ: ئیش بکەن بەو زوانە ﷻ کردەوەکانتان دەردەخاتو پێغەمبەرەکەیﷺ و خاوەن باوەڕان ئاگادار دەکاتەوە لەسەر کردارەکانتانو بەم زوانە دەبرێنەوە بۆلای ئەو کەسەی کەزانەری هەمو نهێنیو ئاشکراکانەو هیچی لەلا ون نابێ، جا ئەو کاتە هەواڵتان پێ دەدات بەو قسەو کارو تەلاشەی کەکردوتانە چاكو خراپ جا ئەگەر چاکبێ پاداشتەکەی بەهەشتەو ئەگەر خراپبێ پاداشتەکەی دۆزەخە ئەگەر خوا چاو پۆشیان لێ نەکات، ئینجا خوا باسی ئەو چەند کەسە دەکات کەلە غەزای تەبوك دواکەوتنو هیچ بەهانەیەکی راستیان نەبو، وەکاتی گەڕانەوەی پێغەمبەریشﷺ هیچ درۆیەکیان نەکردو راستیان بە پێغەمبەرﷺ وتو دەفەرموێ:

(١٠٦) جا هەندێکی تر دوا خران تا فەرمانی خوا بێتو وەزعیان رۆشن بکاتەوە جا یان خوا سزایان دەدات، وەیان تەوبەیان لێ وەردەگرێتو بەراستی خوا زانایەو ئاگادارە بە هەمو نیەتو قسەو ئیشو کرداری بەندەکانی، دانایەو هەمو بڕیارەکانی لە جێگای خۆیدان، ئەگەر بەندەکانی ببەخشێت لەفەزڵ و کەرەمی خۆیەتیو ئەگەر سزایشیان بدات لەدادپەروەریو دادگەرییەتی. بەڵێ هەمیشە پیاوانی خراپو مونافقو بێ باوەڕ لە پیلانو نەخشەکێشان لەدژی ئایینو پەیڕەوانی کۆتاییان نەکردووەو نایکەن ئەوەتە لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ لە شاری مەدینەدا کۆمەڵێك مونافق بەفەرمانی (ئەبو عامری فاسق)بەناو مزگەوتەوە خانویەکیان دروستکرد لە نزیك مزگەوتی (قوبا)وە تا بتوانن کەم کەم لەو شوێنەدا کۆببنەوەو نەخشەو پیلانی خۆیان دژی پێغەمبەرﷺ ئەنجام بدەن، ئەویش بەم شێوەیە بو، پێش ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ بچێتە مەدینە پیاوێکی خەزرەجی تێدابو پێیان دەوت (ئەبو عامری راهیب)ئەمە لە سەردەمی نەفامیدا، چوبوەسەرئاینی مەسیحیو علمی ئەهلی کیتابی

وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مَسۡجِدٗا ضِرَارٗا وَكُفۡرٗا وَتَفۡرِيقَۢا بَيۡنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَإِرۡصَادٗا لِّمَنۡ حَارَبَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ مِن قَبۡلُۚ وَلَيَحۡلِفُنَّ إِنۡ أَرَدۡنَآ إِلَّا ٱلۡحُسۡنَىٰۖ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ (١٠٧) لَا تَقُمۡ فِيهِ أَبَدٗاۚ لَّمَسۡجِدٌ أُسِّسَ عَلَى ٱلتَّقۡوَىٰ مِنۡ أَوَّلِ يَوۡمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِۚ فِيهِ رِجَالٞ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُطَّهِّرِينَ (١٠٨) أَفَمَنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ تَقۡوَىٰ مِنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٍ خَيۡرٌ أَم مَّنۡ أَسَّسَ بُنۡيَٰنَهُۥ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٖ فَٱنۡهَارَ بِهِۦ فِي نَارِ جَهَنَّمَۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (١٠٩) لَا يَزَالُ بُنۡيَٰنُهُمُ ٱلَّذِي بَنَوۡاْ رِيبَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡ إِلَّآ أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمۡۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١١٠) ۞ إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ (١١١)

خوێندبو لەوسەردەمەدا بەندایەتی دەکردو پلەو رێزێکی گەورەی هەبو لەناو خەزرەجیەکاندا، کاتێ کەپێغەمبەرﷺ کۆچی کرد بۆمەدینەو موسڵمانان لە چواردەوری کۆبونەوەو ناوی ئیسلام بەرزبویەوەو خوا لە بەدردا سەری خستن، ئەم (ئەبو عامر)ە زۆر خەفەتی خواردو دوژمنایەتی خۆی دەربڕیو کەوتە دژایەتیو رای کرد چوبۆ ناو کافرو موشریکەکانی مەکەو هەڵینان لەسەر شەڕکردن لە دژی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانیش لەگەڵ ئەو عەرەبانەی کە هاو باوەڕیان بون لەدەوروبەری "مەکە" یەکیان گرتو هاتن بۆ جەنگی "ئوحود" جەنگی ئوحودیش ئەوەبو کە ﷻ باوەڕدارانی تاقی کردەوەو سەرئەنجام هەربۆ پەرهیزکارانە، وەئەم فاسقەیش لە نێوان هەردوو ریزەکەدا چەندین چاڵی هەڵکەند کە پێغەمبەرﷺ کەوتە ناو یەکێکیانو لەورۆژەیشدا بریندارکراو دانە چوارینەکەی خواروی لای راستی شکاو سەری پیرۆزی شکا ئەم فاسقەیش بەدەست پێ کردنی جەنگەکە خۆی گەیاندە خزمە خەزرەجیەکانیو قسەو گفتوگۆیەکی زۆری لەگەڵدا کردنو داوای لێ کردن کە یارمەتی بدەن دژی پێغەمبەرﷺ ئەوانیش کەبە مەبەستی پیسی ئەمیان زانی وتیان: خوا هەرگیز ئەو رۆژەت پێ نەدات ئەی فاسق ئەی دوژمنی ﷻ . وەزۆر قسەی خراپیان پێوت جا بە سەر شۆڕی گەڕایەوەو لەبەر خۆیەوە دەیوت: بەخوا ئەم خزمانەم پاش من زۆر خراپ بوون. بەڵێ پێغەمبەرمانﷺ پێش ئەوەی رابکات بۆ مەکە بانگی کرد بۆ رێگای خواو هەندێ لەقورئانی خوێند بۆی بەڵام ئەو موسڵمان

نەبو پێغەمبەریشﷺ دوعای لێ کرد کە بە شێوەیەکی دوور لە خزمو دەرکراو بمرێت. وەئەم دوعایەش قبوڵ بو. جا پاش جەنگی ئوحود دی کە ئیشی پێغەمبەرﷺ رۆژ بە رۆژ بەرەو چاکترو پەرەسەندن دەڕوات چوبۆلای (هیرقل)ی پاشای رۆمو داوای یارمەتی لێ کرد دژی پێغەمبەرﷺ ئەویش بەڵێنی پێداو ختیە تەماعەوە ئەویش لەوێ مایەوەو هەواڵی نارد بۆکۆمەڵێك لەناو موسڵمانە کۆچەرییەکان کە مونافقو دو دڵ بوون سەبارەت بەئایینی ئیسلامو بەڵێنی پێدانو تەماداری کردن کە بەم زوانە جەیشێك دێنێتە سەر پێغەمبەرﷺ و سەردەکەوێت بەسەریداو کۆتای پێ دەهێنن؟! فەرمانی پێدان کە جێگایەك دروست بکەن کەببێتە بنکە بۆ ئەوکەسانەی کەلای ئەووەوە رەوانە دەکرێن بۆ جێ بەجێ کردنی بڕیارو فەرمانەکانی تا جێگایەکیش بێ بۆ خۆی هەرکاتێ خۆی هاتە لایان، ئەوانیش لە نزیك مزگەوتی قوبادا دەستیان کرد بەدروستکردنی مزگەوتێكو پێش دەرچونی پێغەمبەرﷺ بۆ تەبوك تەواویان کردو هاتنە خزمەت پێغەمبەرﷺ و داوایان لێ کرد کە بێت بۆ ناو ئەو مزگەوتەو نوێژی تێدا بکات تا ببێت بە جێگای باوەڕی موسڵمانانو وتیان: ئەو مزگەوتەمان تەنها بەمەبەستی لاوازو پەکەوتەو بۆ شەوانی زستان دروستکردوە بەڵام خوا پێغەمبەرەکەی خۆی پاراستو فەرمووی:(ئێمە ئێستا لەسەر سەفەرین بەڵام ئەگەر گەڕاینەوە **ان شاء ا** ) بەڵام وەختێ گەڕانەوە ماوەی رۆژێك کەمتری مابو بگاتە مەدینە خوا پێغەمبەریﷺ ئاگادارکردەوەو ئەم چەند ئایەتەی ناردە خوارەوە، جاپێغەمبەرﷺ مالیکی کوڕی دوخشوم لە تیرەی بەنی سالمی بەنی عەوفو مەعنی کوڕی عەدی یان عامری کوڕی عەدی لە تیرەی بەنی عەجلان ناردو فەرموی بڕۆن بۆ ئەو مزگەوتەی ستەمکارانو بیڕوخێننو بیسوتێنن، ئەوانیش چوون ئەم فەرمانەیان جێ بەجێ کرد، جاخوایش دەفەرموێ:

(١٠٧) خۆ ئەوکەسانەی کە مزگەوتێکیان دروستکرد، نە بۆخوا پەرستی بەڵکو بۆ زیانگەیاندن بە پێغەمبەرﷺ، وەبۆ بڵاو کردنەوەی کفرو بۆ دووبەرەکی نانەوە لە نێوان موسڵمانان داو بۆ کەمینگایەك بۆ ئەو کەسەی کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ دەکرد هەر لە کۆنەوەو لەگەڵ ئەوەشدا سوێندیان دەخوارد بەخوا کە ئێمە لەو ئیشەی کە دەیکەین بێجگە لە مەبەستی جوانوچاکە خوازی هیچ مەبەستێکی ترمان نیە، خوایش ئەم تاقمە ناپاکە بە پێغەمبەروﷺ خاوەن باوەڕان دەناسێنێ و بەدرۆیان دەخاتەوەو دەفەرموێ: خۆ ﷲ شایەتی دەدات کە ئەوان درۆ دەکەن. ئینجا فەرمان بە پێغەمبەرﷺ دەداتو دەفەرموێ:

(١٠٨) هەرگیز نەچیتە ناوئەو مزگەوتەوە. ئینجا هەڵی ئەنێ لەسەر رێزگرتنی مزگەوتی "قوبا"و دەفەرموێ: بەراستی ئەو مزگەوتەی کەلە ئەوەڵەوە لەسەر پەرهیزکاری دروستکراوە ئەوە شایستەیە بۆ هاتوچۆی تۆو بۆ بەندایەتی کردنو نوێژ تێدا کردنت کە لەو مزگەوتەدا پیاوانێك هەن کە حەزیان لەوەیە پاكو خاوێن بن، ئەم وەسفە خۆشە سەبارەت بەخەڵکی موسڵمانی (قوبا)هاتوەو مزگەوتەکەیشیان یەکەم مزگەوت بوە کە دروستکراوە، ئاشکرایە مزگەوتی قوبا بناغەی لەسەر پەرهیزکاری دانراوەو مزگەوتی پێغەمبەریشﷺ هەر بەو شێوەیە بوە بەڵکو زیاترە، ئەوەتە نوێژێکی مزگەوتی پێغەمبەرﷺ پاداشی هەزار نوێژی هەیە، جا ئەو ریوایەتانەی کە هاتون سەبارەت بە مزگەوتی (التقوی)بەم شێوەیە کۆ دەکرێنەوەو مانایان راست دەکرێتەوە والله اعلم. بەڵێ خەڵکی قوبا باوەڕدارانێکی پاكو خاوێن بوون بۆیە خوا بەو شێوە ناساندنی بە پێغەمبەرﷺو موسڵمانان، وە خوایش ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە خۆیان پاك دەکەنەوە، چ پاکی ڕواڵەتیو چ پاکی ناودەرونی، پێغەمبەرﷺ پرسیاری لە خەڵکی قوبا کرد سەبارەت بەو پاكو خاوێنیە وتیان: ئێمە هەمیشە پاش ئەوەی کە بە بەرد خۆمان پاك دەکەینەوە بەئاویش خۆمان دەشۆرین پێغەمبەری خوایشﷺ ئافەرینی لێ کردن لەسەر ئەو کردارە جوانەیان، ئاشکرایە ئەمانە هەمیشە خەریکی خۆپاك کردنەوەبوون بەگوێڕایەڵیو ئەنجامدانی فەرمانەکانی پێغەمبەرﷺ ، ئینجا ﷲ بەدرێژتر پێناسەی ئەو دوو مزگەوتەمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٠٩) ئایا ئەو کەسەی کە بناغەی مزگەوتی خۆی لەسەر بناغەی تەقواو پەرهیزکاری دروستکردبێت و بە گوێرەی فەرمانی خواو مەبەستی رەزامەندی ﷲ بوبێت چاکترە یان ئەو کەسەی کە بناغەی مزگەوتی خۆی لەسەر لێوارێکی روخاوو لەپاشان بڕوخێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە دروستکردبێت؟ بەڵێ ئەم تاقمەی دووهەم تاوانبارو ستەمکارنو خوایش رێنمایی گەلی ستەمکار ناکاتو نایان باتە بەهەشتەوە،

(١١٠) هەمیشە ئەو بینایەی کەدروستیانکردبوو بەناو مزگەوتەوە گومانێکە لەسەر دڵیانو هەرگیز بەیەقین ناگەنو هیچ ئاواتێکیشیان بۆ جێ بەجێ ناکرێت هەتا ئەوکاتەی کە دڵیان دەبچڕێت و دەمرنو هەرگیز بەئاوات ناگەنو لەو گومانەش رزگارنابن، وەبەراستی ﷲ زانایە بەسەر هەمو هەڵسو کەوتێکی مرۆڤداو ئیشەکانیشی دانایانەیە چونکە دانایەو هیچ شتێکی بێ سود ناکات، جابە بۆنەی جەنگی تەبووکەوە ﷲ بانگەوازی مامەڵەیەك دەکات لەگەڵ خاوەن باوەڕانداو دەفەرموێ:

(١١١) بەبێگومان ﷲ گیانو ماڵی لە باوەڕداران کڕیوە کە بە بێشك لەباتیاندا بەهەشتیان بۆهەیە ، جا ئەو باوەڕدارانە کێن؟ ئەو باوەڕدارانە ئەو کەسانەن کەلەرێگای خودادا غەزا دەکەن ئەوسا خوا نەناسان دەکوژنو دەکوژرێن، کە ئەمە بەڵێنێکی راستە لەلای خواوە لە تەوراتو ئینجیلو قورئاندا تۆماری کردوە دەی کێ هەیە لە خوا چاکتروەفا بەبەڵێنی خۆی بکات؟ واتە جێگای هیچ گومانو دوو دڵیەك نیە کە ئەو بەڵێنەجێ بەجێ دەکرێت کەوابو مژدە بدەن ئەی موسڵمانان بەیەکتر لەسەر ئەو مامەڵە بەنرخەی کە کردووتانە:

خوا فرۆشندەو ئێوە موشتەری بەهەشت وەرگرنو لێی بکڕن حۆری. وە بەراستی هەر ئەوەیە بەهرەی زۆر گەورە، تێبینی: ﷲ لێرەدا گیانی پێش ماڵ خستوە بەڵام لەو شوێنانەدا کەداوا لە باوەڕداران دەکات کە جیهاد بکەن ماڵ پێش گیان دەخێت، لەراستی دا گیانو ماڵ هەردووکیان دووئەمانەتنو خوا دەیدات بەدروستکراوەکانی خۆی، لای خوا گیانەکە مەبەستی سەرکییە بۆیە بۆ کڕین گیان پێش ماڵ دەخات بەڵام هەڵسوکەوتی مرۆڤ و خۆشەویستی بۆ ماڵ واپیشان دەدات کەلە گیان خۆشەویست تربێ بۆیە لە کاتی بڕیاردان بۆ بەخشینی شت لە رێگای خوادا خوا ماڵ پێش دەخات واتەلای خوا گیان بەنرخەو لای مرۆڤ ماڵ خۆشەویستە ئەوەتە زۆرجار مرۆڤ بۆ بەدەست هێنانی ماڵ گیانی دەخاتە مەترسیەوە، ئینجا ﷲ ئەو موجاهیدە راستەقینانەمان پێ دەناسێنێو دەفەرموێ: ئەوانە ئەو کەسانەن کە ئەم وەسفانەیان تێدابێت،

(١١٢) **یەکەم**: ئەوکەسانەیە کە هەمیشە تەوبە دەکەنو پەشیمان ئەبنەوە لەو هەڵەو تاوانانەی کەکردویانەو باوەڕیان بەسیفەتە بەنرخەکانی خوا لەبارەی تەوبەوە هەیەو هەرگیز بێ ئاگاو کەمتەرخەم نابن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { من رۆژانە زیاتر لە حەفتا جار تەوبەو ئیستیغفار دەکەم}

**دووهەم**: ئەو کەسانەیە کە هەمیشە بە بەندایەتی خواوە خەریکن ئاشکرایە کە بەندایەتی هەمو کارو کۆششێکی مرۆڤ دەگرێتەوە کەلە بەر خوا ئەنجامیان بدات یان لە بەر خوا وازیان لێ بهێنێ جا ئەو حەوت سیفەتەی پاش دێت کەهەریەکەیان بەشێکن لە بەندایەتی بەڵام لەبەر گرنگیان بەجیا باسی کردونو تا خاوەن باوەڕان گرنگیەکی زیاتر بەو جۆرە بەندایەتیە بدەن،

**سێهەم**: ئەو کەسانەیە کە هەمیشە بەزمانو بەهەڵسو کەوت سوپاسی خوای خۆیان دەکەنو منەتی نیعمەتە فرەوانەکانی دەزانن،

ٱلتَّـٰٓئِبُونَ ٱلۡعَـٰبِدُونَ ٱلۡحَـٰمِدُونَ ٱلسَّـٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّـٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَـٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١١٢) مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن يَسۡتَغۡفِرُواْ لِلۡمُشۡرِكِينَ وَلَوۡ كَانُوٓاْ أُوْلِي قُرۡبَىٰ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمۡ أَنَّهُمۡ أَصۡحَـٰبُ ٱلۡجَحِيمِ (١١٣) وَمَا كَانَ ٱسۡتِغۡفَارُ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ إِلَّا عَن مَّوۡعِدَةٖ وَعَدَهَآ إِيَّاهُ فَلَمَّا تَبَيَّنَ لَهُۥٓ أَنَّهُۥ عَدُوّٞ لِّلَّهِ تَبَرَّأَ مِنۡهُۚ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَأَوَّٰهٌ حَلِيمٞ (١١٤) وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُضِلَّ قَوۡمَۢا بَعۡدَ إِذۡ هَدَىٰهُمۡ حَتَّىٰ يُبَيِّنَ لَهُم مَّا يَتَّقُونَۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ (١١٥) إِنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۚ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ (١١٦) لَّقَد تَّابَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلنَّبِيِّ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ وَٱلۡأَنصَارِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ فِي سَاعَةِ ٱلۡعُسۡرَةِ مِنۢ بَعۡدِ مَا كَادَ يَزِيغُ قُلُوبُ فَرِيقٖ مِّنۡهُمۡ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّهُۥ بِهِمۡ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ (١١٧)

**چوارەم**: رۆژوو دەگرن، یان بەلەشو زەین لەگەشتو گوزاردان بۆ بیرکردنەوە لەدەسەڵاتو هێزی خواو ئەنجامدانی حەجو جیهاد بەشێکە لەو گەردشە، وەك پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ:{ **إن سِيَاحَةَ أُمتِي الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللهِ تَعَالى** /أبوداود.صحه الالبا / بێگومان گەشتوگوزاری ئوممەتی من جیهادە لەرێگای ﷲ ی بالادەستدا }

**پێنجەموشەشەم**: ئەوکەسانەن کە هەمیشە بەرکوعو سجودەوە خەریکنو هەرگیز ئەو بەندایەتیە گرنگە لە بیر ناکەن واتە هەمیشە بەنوێژەوە خەریکن کە رکوعو سجود دووبەشی زۆر گرنگی نوێژن ئەوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:{ **وَأما السجُودُ فَاجْتَهِدُوا فِي الدعَاءِ فَقَمِنٌ أَنْ يُسْتَجَابَ لَكُمْ** /مسلم/ ئەمما سوجدەکان زۆر دوعای تێدا بکەن چونکە نزیکە دوعاکانتان لێ وەربگیرێت} لە کاتی سوجدەدا مرۆڤ زۆر لە خواوە نزیك ئەبێتەوە.

**حەوتەمو هەشتەم**: ئەوکەسانەیە کە هەمیشە فەرمان بەچاکە دەکەنو بەرگری لە خراپە دەکەن ئاشکرایە ئەمە پێویستی بەهێزو دەسەڵات هەیە بۆیە پێویستە موسڵمانان هەمیشە خاوەنی دەسەڵاتو عیزەت بن ئەگینا ئەم دوو وەسفەیان تێدا نایەتە جێ، وەئەگەر ئەم دوو وەسفەیش نەهاتەجێ ئاشکرایە، کە پیاوی جیهادو گیان فیدانامێنێو سەرئەنجام بەر بەڵێنی بەهەشت ناکەوێت.

سیفەتی **نۆیەم**: ئەو کەسانەن کەهەمیشە سنورەکانی خوا دەپارێزنو خۆیان لەخراپەو تاوان لادەدەن، ئاشکرایە کەئەو

کەسانەی ئەو نۆسیفەتەیان هەبێت باوەڕدارن بۆیە خوا لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ئەی محمدﷺ مژدەبدە بەوکەسانەی کەباوەڕدارن، جا مژدەی چیان پێ بدرێت باس نەکراوە تا هەمو خێرو چاکەیەکی دنیاو قیامەت بگرێتەوە، بەڵام بێ باوەڕو موشریکان ئەوەندە خراپن خوا ئاگاداری پێغەمبەرﷺ و خاوەن باوەڕان دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(١١٣) پێغەمبەرﷺ و ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە ماڤ ئەوەیان نیە پاش مەرگی موشریکان داوای لێ خۆشبونیان بۆ بکەن ئەگەر چی خزمی نزیکیشیان بن، پاش ئەوەی کە بۆیان دەرکەوت کە دۆزەخین، ئاشکرایە پێغەمبەرﷺ لەلایەن خواوە ئاگادار دەکرا کەدۆزەخین ئەی باوەڕداران چۆن بزانن؟! باوەڕداران بەوە دەزانن مادام کابرا بە موشریکی مردبێ جێگای دۆزەخە، چونکە هاوبەش دانان بۆ خوا تاوانێکی زۆر گەورەیەو بەبێ تەوبەو پەشیمان بوونەوە بەرلەمەرگ خوا چاوپۆشی لێ ناکاتو دەیخاتە دۆزەخەوە وەك لە سورەتی (**النساء**)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾ بە بێگومان کە ٱللَّهُ هەرگیز خۆش ناوێ لەوەی کە شەریکی بۆ دابنرێت، وە لە خواروی شیرکەوە ٱللَّهُ لە گوناهەکانی تر خۆش دەبێت بۆ هەر کەسێك کە ئارەزۆی لێ بێت وە لە سورەتی (بەینە)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ٦ ﴾ بێگومان ئەوکەسانەی کە بێ باوەڕبون لە پەڕاوداران‌و لە بت پەرستان لەناو ئاگری دۆزەخدان بۆ هەمیشەیی، ئەوانە پیسترین دروستکراوی خودانﷻ وە سەدان ئایەتی ترو فەرمودەی پێغەمبەرﷺ بەم مانایە هەیە، بەڵێ تا لە دنیادا بن دروستە دوعای هیدایەتیان بۆ بکرێت، بۆ هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە چەند شت باسکراوە دەگونجێت چەند بار دابەزینی دووبارە بوبێتەوە یەکێك لەو هۆیانە کە ئیمامی ئەحمەدو بوخاری‌و موسلم بۆمان ئەگێڕنەوە ئەوە بووە کە لەکاتی سەرەمەرگی ئەبو تالیبدا پێغەمبەرﷺ هاتەلای کە ئەبو جەهل‌و عەبدوڵای کوڕی ئومەیەی لەلابو فەرموی(ئەی مامی خۆم بڵێ (**لاالە الا ا** ) وشەیەکە کەمن بیکەم بەبەڵگە بۆت لە پێشگای خوادا)گورج بەپەلە ئەبو جەهل‌و عەبدوڵا وتیان: ئەی ئەبو تالیب تۆ واز لە ئایینی عەبدولموتەلیب دەهێنی؟ ئەویش وتی: من لەسەر ئایینی عەبدولموتەلیبم، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرموی: من داوای لێ خۆشبونت بۆ دەکەم هەتا ئەوکاتەی کەبەرگری دەکرێم، جا ئەم ئایەتە دابەزی‌و ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ... ﴾ راوییەکە دەڵێ هەروەها لەبارەی ئەبو تالیبەوە ئایەتی پەنجاو شەشی سورەتی قصص﴿ إِنَّكَ لَا تَهۡدِي مَنۡ أَحۡبَبۡتَ ﴾ دابەزیوە. جابەگوێرەی ئەم ئایەتە نابێ خاوەن باوەڕان دوعای خێر بکەن بۆئەوکەسانەی کەبە موشریکی مردوون هەرچەند خزمی نزیکیشیان بن، لێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە ئەویش ئەوەیە کە ئیبراهیم عليه السلام کاتی خۆی بەڵێنی داوە دوعا بکات بۆ باوکی وەك لە سورەتی مەریەم ئایەتی چل‌وحەوتدا دەفەرموێ:

﴿ سَأَسۡتَغۡفِرُ لَكَ رَبِّيٓۖ ﴾ بەم زوانە لەپەروەدگارم داوای لێ خۆشبونت بۆدەکەم، کەچی لێرە خوا بە پێغەمبەروﷺ خاوەن باوەڕان دەفەرموێ دوعایان بۆ نەکەن ئایا ئەم دوو هەڵوێستە دژی یەك نین؟ خوا دەفەرموێ:

(١١٤) داوا کردنی ئیبراهیم بۆ ئەوەی خوا لە گوناهی باوکی خۆش ببێت لەبەر بەڵێنێك بو کە دابوی بەباوکی کە وتبوی دوعات بۆدەکەم کە خوا لێت خۆش ببێت بەڵام کاتێك کەبۆی دەرکەوت کەدوژمنی خوایەو لێی خۆش نابێت ئیبراهیم بێزاری خۆی دەربڕی‌و ئیتر دوعای خێری بۆ نەکردو دەفەرموێ: بێگومان کە ئیبراهیم زۆر خەفەتی دەخواردو هەمیشە هەناسەی ناڕەحەتی‌و خەفەتی هەڵدەکێشاو زۆر بەحەوسەڵە بو. لەگەڵ دوژمنایەتی کردنی باوکی بۆی ئەو هەر قسەی جوانی دەکردو بەڵێنی دوعای خێریشی پێدا بەڵام خۆشەویستیش سنوری هەیە، باوەڕداری راستەقینە ئەبێ تەنها خواو پێغەمبەرﷺ و خاوەن باوەڕانیان خۆش بوێت‌و بێزاری خۆیان دەربڕن سەبارەت بە دوژمنانی خواو پێغەمبەر ﷺ و باوەڕداران، ئەمە بناغەیەکی زۆر گرنگی ئاینە و ڕێگای ئەهلی تەوحیدو یەکخواناسیە کە ئیبراهیم سەر قافڵەی ئەو کاروانەیە، کەواتە ئیبراهیمیش دوعای نەکردوە بۆ موشریکان.

(١١٥) ئەوسا خوا هیچ گەلێك گومڕاو سەرلێ شێواو ناکات پاش ئەوەی کە ڕێنمایی کردن‌و ڕێگای ڕاستی پیشان دان‌و ئەوانیش ئەو ڕێگایان گرتەبەر تا بۆیان ڕۆشن نەکاتەوە ئەو شتانەی کە پێویستە خۆیانی لێ بپارێزن، واتە ئەوانەی کە داوایان کردوە کە خوا لە موشریکان خۆش بێت تا ئێستا نەیان زانیوە کەخراپە ئەوانە هیچ تاوانێکیان لەسەر نانوسرێت، بەڵام پاش ئەوەی کەزانیان فەرمانی خوا دوعا نەکردنە بۆیان بەڵام ئەوان گوێیان بەو فەرمانە نەداو دوعایان بۆ کردن تاوانبارن‌و شایستەی سزای سەختن، وە دەبێ بزانن کە بێگومان ٱللَّهُ هەمو شتێك دەزانێت‌و هیچی لێ ون نابێت، واتە:خوا هیچ گەلێك پاش پێ گەیشتنی پەیامی خۆی لاڕێ‌و گومڕاناکات تا بەچاکی هەمو چاکەو خراپەیەکیان بۆ ڕۆشن نەکاتەوەو بەهانەیان نەبڕێت کەئەمەش

داناییو دادگەری خوای خاوەن دەسەلآت دەگەیەنێت، ئینجا خوا باسی فرەوانی موڵكو دەسەلآتی خۆی دەكاتو دەفەرموێ:

(١١٦) بەبێگومان خاوەنیەتی ئاسمانانو زەوی تایبەتی خوایەو كەسی تر تێیدا هاوبەش نیەو هەر ئەوە زیندو دەكاتەوەو هەر ئەویشە دەمرێنێتو بۆ ئێوە ئەی كۆمەڵی باوەڕداران بێجگەلە ﷲ هیچ دۆستێكو هیچ یارمەتی دەرێك نیە جا ئێوە كە باوەڕتان بە خوا هەیە مەترسنو دڵنیابن لەهەمو تەنگو چەڵەمەیەكدا خواتان لەگەڵدایەو یارمەتیتان دەدات.

(١١٧) بەراستی خوا تەوبە وەردەگرێت لە پێغەمبەرو كۆچەرییو یارمەتی دەران ئەوانەی كەدوای پێغەمبەرﷺ كەوتن لەو كاتە تەنگانەداو چوون بۆ غەزای تەبووك لەپاش ئەوەی كەنزیكبو دڵی هەندێك لەوان لاداتو دوچاری هەڵە ببێت بەڵام چونكە زۆر دڵسۆز بون خوا لەو لادانەی پاراستن، پاشان خوا تەوبەی لێ وەرگرتن بێگومان كەئەوزاتە میهرەبانو بەسۆزە بۆ باوەڕداران، ئەوەتە لەگەڵ ئەوەشدا كەدڵی هەندێكیان نزیكبو بێزاربێت لە ئایینو پەیڕەوی پێغەمبەرﷺ ودوربكەوێتەوە، خوا بەلوتفی خۆی چاوپۆشی لێ كردنو بەم ئایەتانە دڵی دانەوە، هەروەكو سەبارەت بەو سێ كەسەیش كەراستییان وتو پێغەمبەرﷺ دوعاكەی دواخستنو ماوەی چل ڕۆژ كەس قسەی لەگەڵدا نەكردن، دەفەرموێ:

(١١٨) ئەوسا خوا تەوبەی لەو سێ كەسەش كە دواخران وەرگرت ئەو سێ كەسە (كەعبی كوڕی مالیكو موراڕەی كوڕی ڕەبیعی عامریو هیلالی كوڕی ئوممەیەی واقیفی)بوون كە پاش گەڕانەوەی پێغەمبەرﷺ ئەوانەی كەنەچوبون بۆ"تەبووك" هاتنە خزمەتیو هەركەسێك بەهانەیەكی بۆ خۆی باسكردو پێغەمبەریش داوای لێ خۆشبونی بۆ كردن بەڵام ئەو سێ كەسە هیچ درۆیەكیان نەكردو وتیان: دواكەوتنەكەمان بێ بەهانەبوە پێغەمبەریشﷺ دوعای بۆ نەكردنو دوای خستن ئەوانیش بەراستی لەو دواكەوتنەی خۆیان زۆرپەشیمان بون بەڵام كەس قسەی لەگەڵدا نەدەكردنو زۆر زۆر دڵتەنگو بێ تاقەت بون وەك خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ئەمانە دوا خران تاوایان لێ هات ئەو زەوییە فرەوانەیان لەلا تەنگ بو، وەئەوەند ناڕحەت بوون كە وایان لێ هاتبو گیانی خۆیان بوە ملو نەیان دەزانی چی بكەنو یەقینیان پەیدا كرد كە هیچ پەنایەك نیە بێجگە لە پەنای خواو گەڕانەوە بۆلای ئەو، لەبەر ئەوە هەرخەریكی یادی

وَعَلَى ٱلثَّلَٰثَةِ ٱلَّذِينَ خُلِّفُواْ حَتَّىٰٓ إِذَا ضَاقَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَرۡضُ بِمَا رَحُبَتۡ وَضَاقَتۡ عَلَيۡهِمۡ أَنفُسُهُمۡ وَظَنُّوٓاْ أَن لَّا مَلۡجَأَ مِنَ ٱللَّهِ إِلَّآ إِلَيۡهِ ثُمَّ تَابَ عَلَيۡهِمۡ لِيَتُوبُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ (١١٨) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ (١١٩) مَا كَانَ لِأَهۡلِ ٱلۡمَدِينَةِ وَمَنۡ حَوۡلَهُم مِّنَ ٱلۡأَعۡرَابِ أَن يَتَخَلَّفُواْ عَن رَّسُولِ ٱللَّهِ وَلَا يَرۡغَبُواْ بِأَنفُسِهِمۡ عَن نَّفۡسِهِۦۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ لَا يُصِيبُهُمۡ ظَمَأٞ وَلَا نَصَبٞ وَلَا مَخۡمَصَةٞ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَطَـُٔونَ مَوۡطِئٗا يَغِيظُ ٱلۡكُفَّارَ وَلَا يَنَالُونَ مِنۡ عَدُوّٖ نَّيۡلًا إِلَّا كُتِبَ لَهُم بِهِۦ عَمَلٞ صَٰلِحٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (١٢٠) وَلَا يُنفِقُونَ نَفَقَةٗ صَغِيرَةٗ وَلَا كَبِيرَةٗ وَلَا يَقۡطَعُونَ وَادِيًا إِلَّا كُتِبَ لَهُمۡ لِيَجۡزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحۡسَنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (١٢١) ۞ وَمَا كَانَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لِيَنفِرُواْ كَآفَّةٗۚ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ (١٢٢)

خواو گریان بون پاشان خوا تەوبەی لێ وەرگرتن تائەوانیش بگەڕێنەوە بۆلای خوا بێگومان كە ﷲ تەوبەوەرگرەو بە بەزەییە سەبارەت بەبەندەكانی خۆی. بەڵێ خوا لەو سێ كەسەش خۆشبو كەبەراستی لەتاوانی خۆیان پەشیمان بونەوەو بەراستی قسەیان كردو دانیان بەهەڵەی خۆیاندا نا، واتەراستی بوبە هۆی سەرفەرازیو بەختەوەریان هەر بۆیە لە پاش گەڕاندنەوەی باسی ئەو سێ كەسە خوا فەرمان دەدات بەسەر خاوەن باوەڕانداو دەفەرموێ:

(١١٩) ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە بترسن لە ﷲ و لەگەڵ ڕاستگۆیاندابن چونكە ئەو دووهۆیە(پەرهیزكاریو بون لەگەڵ ڕاستگۆیاندا) مایەی سەرفەرازیو خۆشبەختی هەردوو دنیایە بۆ مرۆڤی خاوەن باوەڕ، ئینجا خوا خەڵكی مەدینە هەڵ دەنێ لەسەر جیهادو دەفەرموێ:

(١٢٠) خەڵكی مەدینەو چواردەوری مافی ئەوەیان نیە كە لە جیهادو دەرچون لە خزمەتی پێغەمبەرﷺ دا دوابكەون وەئارەزۆیان لە خۆشیو ئیسراحەتی خۆیان هەبێو گوێ بەزەحمەتو ئێشو ئازاری پێغەمبەرﷺ نەدەن، بەڵكو باوەڕی هیچ باوەڕدارێك تەواو نیە هەتا پێغەمبەریﷺ لەگیانو ماڵو منداڵو هەمو كەسێكی خۆی خۆشتر نەوێت، ئینجا باسی ئەو پاداشە گرنگانە دەكات،كە مرۆڤ پاڵ پێوە دەنێت كەلە جیهادو

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلۡكُفَّارِ وَلۡيَجِدُواْ فِيكُمۡ غِلۡظَةٗۚ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ فَمِنۡهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمۡ زَادَتۡهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنٗاۚ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَزَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَهُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَتۡهُمۡ رِجۡسًا إِلَىٰ رِجۡسِهِمۡ وَمَاتُواْ وَهُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ أَوَلَا يَرَوۡنَ أَنَّهُمۡ يُفۡتَنُونَ فِي كُلِّ عَامٖ مَّرَّةً أَوۡ مَرَّتَيۡنِ ثُمَّ لَا يَتُوبُونَ وَلَا هُمۡ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٢٦﴾ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ نَّظَرَ بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٍ هَلۡ يَرَىٰكُم مِّنۡ أَحَدٖ ثُمَّ ٱنصَرَفُواْۚ صَرَفَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُم بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٢٧﴾ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَقُلۡ حَسۡبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَهُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾

## سُورَةُ يُونُسَ

١٠ — ١٠٩

گیان فیدائیدا كۆتایی نەكاتو هەمیشە ئامادەو لەسەر پێ بێ بۆ جیهادو گیان فیدا كردن لەرێگای بەرزكردنەوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام داو دەفەرموێ: لەبەرئەوەی داوای دەرچون بۆ جیهادیان لێ دەكات چونكە ئەوان دوچاری هیچ تینوبونێك نابنو توشی هیچ ماندو بونێك نابنو هیچ برسێتیەكیان تووش نابێت لەرێگای اللّٰه داو پێ بەهیچ جێگایەكدا نانێن كەبببێت بەهۆی رق هەستانو خەمو پەژارەی كافران، وەهیچ شتێكیان دەست ناكەوێت لەسەروەتو سامان یان زاڵ بون بەسەر دوژمناندا مەگەر اللّٰه بۆیانی تۆماركردبێ بەكردەوەی چاك، وەئەمانەی كەئاوا ئیش دەكەن چاكەكارنو بێگومان اللّٰه یش ئیشی چاكە كاران زایەناكاتو پاداشتی خێریان پێ دەداتەوە بەچەندین بەرانبەر، وەئەوە نیشانەو بەرهەمی بیرو باوەڕیانەو بەڵگەی پاكیو راستی شایەتومانیانە.

﴿١٢١﴾ خۆهیچ شتێكیش نابەخشن نەبچوكو نەگەورە لەبەر رەزامەندی خواو بەرزو بەهێزكردنی ئایینەكەیو هیچ شیوێك نابڕن بۆ جیهاد لەرێگای خوادا مەگەر خوا بۆی تۆماركردبنو هیچیان لەلای خوا ون نابێو حیسابیان بۆ دەكات تا اللّٰه پاداشتیان چاكتر لەو كردارەی كە كردویانە پێ بداتەوە، بەراستی ئەمە چاكترین پاڵنەرەو جوانترین هەڵنەرە بۆئەوەی خاوەن باوەڕان زیاتر بەدەم جیهادەوە بڕۆنو كەم تەرخەمی تێدانەكەن، ئینجا اللّٰه شێوەی دەرچون بۆ جیهاد باس دەكاتو دەفەرموێ:

﴿١٢٢﴾ شتێكی راستو رەوانیە كە باوەڕداران هەمویان دەربچن بۆ جیهاد چونكە ئەو دەرچونە ئەبێ بەهۆی دواكەوتنی زۆربەی كاروباری ناوخۆی موسڵمانانو سەرئەنجام كەم دەستیو لاوازبوونی ئابووریان بەڵكو ئەبێ بەگوێرەی پێویستو بەفەرمانی فە رماندەی موسڵمانان باوەڕداران دەربچن بۆ جیهاد وەك ئەفەرموێ: بەڵێ واچاكترە بۆیان كەلە هەمو تیرەو شارو گوندێك كۆمەڵێكی لێزانو بەهێزو چالاك لەباوەڕداران دەربچێت بۆ جیهادو وەئەویشی كە ماوەتەوە نابێ بەشتی بێ سودەوە خەریك ببن بەڵكو پێویستە بەزانیاری ئایینەوەخەریك ببن تاشارەزاببن لەبارەی ئایینەوە، بۆچی؟ تا گەلەكانی خۆیان بترسێنن لە خراپەو خراپەكاریو لە سزاو تۆڵەی پاشەڕۆژ هەركاتێ گەڕانەوە ناویان بەڵكو ئەوانیش بیر لە پاشەڕۆژی خۆیان بكەنەوەو بترسن لە اللّٰه و لەخراپەو خراپەكاری بگەڕێنەوە لێرەدا ئەم چوار خاڵەی خوارەوە لەم ئایەتە پیرۆزە وەردەگرین :

**یەكەم:** گرنگی جیهادو نابێ پشت گوێ بخرێت ئەبێ هەمو تیرەو شارو گوندێكی موسڵمان كۆمەڵێك موجاهیدی هەبێت.

**دووهەم:** فێربونی ئایین ئەركێكی هەرە گرنگی سەرشانی باوەڕدارانە چونكە بە پەیەڕەوی كردنی ئایین مرۆڤ خۆشبەختی هەردوو ژیانی دەست دەكەوێت جا ئەگەر ئایین نەناسێت چۆن پەیڕەوی دەكات؟

**سێهەم:** زانایان ئەبێ لە گەیاندنی پەیامی اللّٰه دا كەم تەرخەمی نەكەن.

**چوارەم:** خاوەن باوەڕان لە جیهاددا فێری ئەو فەرزە بەنرخە دەبن بەقسەو باسكردن ناتوانن لەو شتانە تێ بگەن كەلە گۆڕەپانی خەباتو جیهاددا فێری دەبن كەئەمە خۆی یەكێكە لە تەفسیرەكانی ئەو ئایەتە پیرۆزە زۆركەس هەیە بەسەرو سیماو قسەی قەڵەوو پڕزرقو برق خۆی بەگەورەو پاڵەوانی مەیدان دائەنێت بەڵام لەكاتی مەیداندا هیچ دەورێكی نابێو زۆر كەسیش هەیە لە كاتی ئیسراحەت دا هیچ حیسابێكی بۆناكرێت كەچی لە مەیدانی جیهادا چالاك ترینو لێ هاتوترین سەربازی مەیدان دەبێت كەواتە جیهاد كورەی مرۆڤ سازییە بۆیە بە سەنگەری هەرەبەرزی ئایین دانراوەو موجاهیدین پاداشتێكی گەورەی وایان هەیە كە كەس پێی ناگات، ئەوەتە پێغەمبەرمانﷺ ئاوات دەخوازێت كە چەندین جار گیانی تێدا بكرایەو لە رێگای خوادا

بەختی بکردایە، لەگەڵ ئەوەش کە پێغەمبەرێکی هەرە پایەبەرزی خوایەو لەهەمو تاوانێکیش بەخشراوە.

(١٢٣) ئەی ئەوکەسانەی کە باوەڕتان هێناوە شەڕ بکەن لە گەڵ ئەوکەسانەی کە نزیکتانن لە کافرانو ئەبێ وایان تێبگەیەنن کە ئێوە زۆر توندو دڵ ڕەقن بەرانبەر بەوان تاتەماعتان تێ نەکەنو توشی شەڕ نەبن، واتە پێویستە موسڵمانان پێشەکی دەوروبەری خۆیان پاك بکەنەوە، ئینجا بەم لاولادا پەل بهاوێژنو شەڕ لەگەڵ بێ باوەڕانی دوورتردا بکەن کە شەڕ لەئیسلامدا بۆ نەهێشتنی شەڕە بەڵام ئەوەنەبێ ئەوشەڕەو ئەو جیهادە بەنرخەو ئەو دڵ ڕەقییە ببێ بەهۆی زیادەڕەویو دەرچون لە سنوری ترسان لە خوا و پەرهیزکاری بۆیە لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: دەی بزانن بەبێشك ﷲ لەگەڵ پەهیزکارانداییە بەچاودێریو پشتیوانیو یارمەتی دانیان. لێرەدا هەم مژدەیە هەم هەڕەشە مژدەیە بۆپەرهیزکاران کە خوا یارمەتی دەرو پشتیوانو چاودێریانەو باکیان لە هیچ نەبێت، هەڕەشەیشە لەو باوەڕدارانەی کەپەرهیزکار نەبنو هەم لەو کافرانەی کە ﷲ دژایەتیان دەکاتو پەرهیزکارانیان لێ هان دەداتو یارمەتیشیان دەکاتو دەفەرموێ:

(١٢٤) خۆ هەرکاتێك سورەتێك لە قورئان بهاتایە خوارەوە بۆ پێغەمبەرﷺ لەناو ئەو خەڵکەی دەوروبەری پێغەمبەرﷺ کەسی واهەبوە کە دەیوت: کام لە ئێوە بەهۆی ئەم سورەتەوە باوەڕی زیادی کردوە واتە گاڵتەیان پێ دەکردو خوایش دەفەرموێ: بەڵام ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە، ئەمانە بەو سورەتانە باوەڕیان زیادی کردوە لەحاڵێکدا کەئەوان مژدەیان بەیەکتر دەدا کەئەم سورەتە لەلایەن پەروەردگارمانەوە هاتوەو کەیف خۆشو شادمانن پێی

(١٢٥) بەڵام ئەوانەی کەلەناو دڵیاندا نەخۆشی نیفاق هەبو ئەوانە بەهۆی ئەوسورەتەوە خراپەو تاوانیان بەرەوزیاترو زیاتر ڕۆیشت چونکە دژایەتیان کردو بەناڕەوایان دەزانیو لەسەر ئەو بیرو باوەڕە چەوتە مانەوە هەتا دوا هەناسەیانو بەکافریوخوانەناسی مردن. ئینجا خوا سەبارەت بەو بێ باوەڕانە دەفەرموێ:

(١٢٦) ئایا ئەوان نابینن لە هەمو ساڵێکدا جارێك یان دوو جار بەبەڵاو نخۆشیو گرانی تاقی دەکرێنەوە؟ بەڵێ بەراستی هەمو بێ باوەڕێك لەهەمو سەردەمێکدا ساڵی جارێك یان زیاتر خوا بەهۆی ڕوداوو کارەساتی گەورەوە ئاگاداریان دەکاتەوە بەڵام ئەوان لەپاش ئەوەش تەوبە ناکەنو بیری لێ ناکەنەوە.

(١٢٧) کاتێك کە سورەتێك سەبارەت بە بیروڕا چەوتەکانی ئەوان دادەبەزی هەندێکیان تەماشای هەندێکی تریان دەکردو دەیان وت: ئایا محمدﷺ، یان هیچ کەسێك ئێوەی دیوە؟ بەڵێ وەختێ ئەو سورەتانە دادەبەزینو کارو تەلاشو نیەتی ئەوانی باس دەکرد چونکە باوەڕیان بەوە نەبو کە پێغەمبەرﷺ ڕاستەو لەلایەن خواوە هەواڵی پێدەگات گومانیان لەنەفەری خۆیان بو کە ئەو قسانەی بە پێغەمبەرﷺ گەیاندبێ بۆیە هەرسورەتێکی ئاوەهای کەدەهاتە خوارەوە دەستیان دەکرد بەپشکنینو لێ کۆڵینەوەو گومانیان لەرەفیقەکانی خۆیان دەکرد، ئیترنەبیریان لە ڕاستی پێغەمبەرﷺ دەکردەوەو نەژیریان دەخستەکارەوە بەڵکو لەپاش ئەوە پشتیان لە ئاینی خوا دەکردو خوایش دڵی ئەوانی گۆڕیو دووری خستنەوە لە ئایین چونکە بەبێشك ئەوان گەلێکن دەرکی هیچ ناکەنو هیچ ڕاستیەك نافامن ئەگینا هەرسورەتێك بهاتایە خوارەوە دەست بەجێ بەدڵو بەگیان وەریان دەگرتو سوپاسی ﷲ یان دەکرد. ئینجا خوا منەت دەخاتە سەر باوەڕدارانو دەفەرموێ:

(١٢٨) بەراستی هاتوەتەلای ئێوە ئەی خەڵکینە پێغەمبەرێك کە لە خۆتانەو چاکی دەناسنو لە نزیکەوە هەڵسو کەوتی ئەوتان دیوەو دەزانن کەمرۆڤێکی دەستو زمان پاكو داوێن پاكو ژیرەو ئەوەندە میهرەبانە سەبارەت بە ئێوە کە زۆر ناڕەحەت دەبێت بەو شتەی کە ئێوە ناڕەحەت دەکاتو زۆر سوورە بۆ دابین کردنی خێرو چاکە بۆتانو زۆر میهرەبانەوبەبەزەییە سەبارەت بەباوەڕداران جا ئەگەر بە گوێی بکەنو فەرمانەکانی ئەنجام بدەن بەسودی خۆتانە

(١٢٩) خۆ ئەگەر پشتیشی تێ بکەنو گوێی پێ نەدەن ئەوە پشتتان لە ئایینی خوا کردوەو خۆتان زیانتان لێ دەکەوێتو هیچ زیانێك بە پێغەمبەرﷺ ناگات بۆیە خوا دڵنەوایی پێغەمبەرﷺ دەکاتو دەفەرموێ: ئەی محمدﷺ بڵێ بەسە خوا بۆ منو هیچ پەرستراوێکی تری ڕاست نیە بێجگە لەو، وەمن تەنها پشت بەو دەبەستمو هەر ئەو بەپشتو پەنای خۆم دەزانم، وەهەر ئەوە پەروەدگاری عەرشی گەورە ئەوعەرشەی کە بانە بۆ هەمو دروستکراوەکانی تری خواو داپۆشەریانە دڵنیام کەمنی لەبیر ناچێت، ئوبەی کوڕی کەعب دەڵێ: دواترین ئایەت کەدابەزیوە ئەم ئایەتەیە ﴿ لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ ﴾ هەتا کۆتایی سورەتەکە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿١﴾ أَكَانَ لِلنَّاسِ عَجَبًا أَنْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ رَجُلٍ مِّنْهُمْ أَنْ أَنذِرِ ٱلنَّاسَ وَبَشِّرِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَنَّ لَهُمْ قَدَمَ صِدْقٍ عِندَ رَبِّهِمْ ۗ قَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ ۖ يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَ ۖ مَا مِن شَفِيعٍ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ إِذْنِهِۦ ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ إِلَيْهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ إِنَّهُۥ يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَهُمْ شَرَابٌ مِّنْ حَمِيمٍ وَعَذَابٌ أَلِيمٌۢ بِمَا كَانُوا۟ يَكْفُرُونَ ﴿٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ ٱلشَّمْسَ ضِيَآءً وَٱلْقَمَرَ نُورًا وَقَدَّرَهُۥ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ يُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ إِنَّ فِى ٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ ٱللَّهُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾

## ١٠ سورەتی یونس ١٠٩

سورەتی یونس کە سورەتی دەهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، ‌سەدونۆ ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاویەکەمەو پاش سورەتی (بەنی **إسرائیل**)و پێش (**هود**) دابەزیوە. ئەم سورەتە لەگەل چوار سورەتی تردا بە ﴿الٓر﴾ دەست پێدەکات، جا هەر کام بە ناوی پێغەمبەرێك یان بەناوی گەلەکەی ناو براون، ناوی پێغەمبەر یونس ﷺ چوارجار لە قورئاندا (لە سورەتی نیساء و ئەنعام و یونس و صافات)دا هاتوەو لە سورەتی ئەنبیاش بەسەرهاتەکەی باسکراوە بەلام ناوی نەهاتوە.

بەناوی اللَّه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ ئەلیف،لام،را. ئائەوە ئایەتو نیشانەکانی پەڕاوێکی پڕ لە دانایی‌و حیکمەتە.

﴿٢﴾ئایا لای خەڵك شتێکی سەیرە کە ئێمە وەحی بکەینە لای پیاوێك لە خۆیان‌و بڵێین کە خەڵکانی بێ باوەڕو کافر بە سزای دۆزەخ بترسێنە و مژدەبدە بەو کەسانەش کەباوەڕیان هێناوە کە پاشەڕۆژێکی چاکیان بۆ هەیەو سەر ئەنجامێکی چاك چاوەڕێیانە؟ جا لە جیاتی باوەڕ هێنان، کافران وتیان: بێگومان ئائەمە جادوگەرێکی ئاشکرایە لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر بەچاکی پێغەمبەریانﷺ ئەناسی کە نە درۆزنەو نە جادوگەرە، ئینجا اللَّه دەفەرموێ:

﴿٣﴾ بێگومان پەروەردگارتاناللَّه یە کە ئاسمانان وزەوی لەشەش رۆژدا دروستکردوە، هەر چەندە خودا توانایی ئەوەی بوە کە بەیەك جار دروستیان بکات تا ئێمە فێری هێواشی‌و پەلە نەکردن بکات. لەپاشان وەستا لەسەر عەرش بەو شێوەی کەشایانی خودایەو ئێمە چۆنیەتیەکەی نازانین، هەروەك لەزاتیدا بێ وێنەیە هەروەها لەسیفەتەکانیشیا بێ وێنەیە، هەمو کاروبارەکانی ئەم بونەوەرە هەر ئەو بەڕێوەی دەبات، هیچ پاڵپشتێك نیە بۆ مرۆڤ مەگەر لەپاش ئەوەی کەئەوماوەبدات ئەو زاتەش اللَّه یە، پەروەردگارتانە جا سەری بەندایەتی بۆ نەوی بکەن‌و بیپەرستن ئایا پاش ئەو بەڵگە رۆشنانە ئێوە بیرناکەنەوە؟

﴿٤﴾ هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە هەموتان‌و کۆتان دەکاتەوە بۆ حیسابو پاداشت و سزاو کەس ناتوانێ خۆی لێ بشارێتەوە، بەڵێنی خودایەو وە بەڵێنی خوداش راستە و مردن‌و گەڕانەوە بۆ دادگای خواو حیسابو پاداشت و سزا شتێکی بێ گومانەو راستە چونکە بێگومان هەر ئەو پێشەکی ئەم دروستکراوانەی دروستکردوەو هیچ پاڵپشتو هاوبەشی نەبوە لە پاشان پاش مەرگ زیندوی ئەکاتەوە. بۆ؟ تا اللَّه بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە بەدادپەروەرانەو بەرێك‌و پێکی‌و بەبێ زیادو کەم پاداشتیان بداتەوە، وە ئەوانەی کە کافرو خوا نەناسن بۆ ئەوان هەیە خواردنەوەیەك لە ئاوێکی زۆر داخ واتە کاتێك کە داوای ئاو دەکەن ئاوێکیان پێ ئەدرێت کە ئەوەندە گەرم‌و داخە کە ریخۆڵە کانیان پارچە پارچە دەکات وەك لە سورەتی محمد ئایەتی پانزەدا دەفەرموێ:﴿ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ / ئاوێکی گەرمیان پێ ئەدرێت کە ریخۆڵەکانیان پارچەپارچە ئەکات﴾

بەلام نامرن تاڕزگاریان ببێ. لێرەش فەرموی: بۆئەوان هەیە ئاوێکی زۆر گەرم‌و داخ‌و سزایەکی دەردناك بەهۆی ئەوەوە کە بێ باوەڕو کافربوون ئەگینا ئاوایان لەگەڵدا نەئەکرا بەم شێوەیە خوایەتی خوداو پەروەردگاریەتی بوبە شتێکی زۆر روون. ئینجا چەند بەڵگەیەکی گەورەو لەبەرچاومان بۆباس ئەکات‌و ئەفەرموێ.

﴿٥﴾ خوا ئەو زاتەیە کە خۆری دروستکردوە کە هۆی رووناکییەو مانگیشی کردوە بە گڵۆپێکی زۆر رووناك (**نور و ضیاء**) هەردووك رووناکین بەلام روناکی رۆژ زیاترەو گەرمایشی لەگەڵدایە بەلام روناکی مانگ کەمترەو گەرمایی لەگەڵدانیە، وە

بۆمانگ چەند قۆناغو مەنزڵێكمان داناوە، واتە: بۆ هەمو جارێكی مانگ بیستو هەشت قۆناغ دیاری كراوەو هەرشەوەی لە جێگایەكی تایبەتەوە هەڵدێو لە جێگایەكی تایبەتەوە ئاوا دەبێت، بۆچی؟ تاكو ژمارەی ساڵەكانو حیسابی پێ بزانن كە ﷲ ئەمەی دروست نەكردوە مەگەر تەنها لەبەر شتێكی راستو رەوا، بەراستی زۆر جوانو بەجێیە كاتێ مرۆڤ قورئان ئەخوێنێو ئەگات بەم جۆرە ئایەتانە بڵێ ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ / آل عمران: ١٩١/ ئەی پەروەردگارمان ئەمەت بەبێ هودە دروست نەكردوە، دەی داوات لێ ئەكەین كە لە سزای ئاگربمان پارێزە﴾ بەڵێ پەروەردگار بەم شێوەیە درێژە ئەدات بە ئایەتەكانی بۆگەلێك كەوا زانایی بكەن بەپیشەی خۆیان. ئینجا خوای میهرەبان درێژە بە نیشانەكانی دەسەڵات وگەورەیی و تەنیایی خۆی ئەداتو ئەفەرموێ:

(٦) بێگومان لە گۆڕانی شەوو رۆژداو لەوەی كە خوا دروستی كردون لەناو ئاسمانانو زەوی دا چەندین بەڵگەی گەورە هەیە لەسەر هێزو تەنیایی خوا بۆ گەلێك كەلە سزاو تۆڵەی ﷲ خۆیان دەپارێزن، لەراستیدا ئەمانە گەورەترین بەڵگەن بۆ هەموكەس بەڵام تەنها پارێزكاران سودیان لێ وەرئەگرن بۆیە وای فەرمو، ئینجا هەڕەشەیەكی توند لە بێ باوەڕان ئەكات وئەفەرموێ:

(٧) بێگومان ئەوكەسانەی كە ئومێدی گەیشتن بە ئێمەیان نییەو ناترسن لە پاشەرۆژو رازین بەژیانی دنیاو دڵنیان بەو ژیانەو وادەزانن كەلە دەستیان ناچێتو هەمیشە بۆیان ئەمێنێتەوە، وەئەوانە ئەو كەسانەن كە لەئایەتەكانی ئێمە لەم بوونەوەرەدا بێ ئاگان.

(٨) جێگای ئەوانە ئاگرە بەهۆی ئەو كردوە ناپاكانەی كە ئەنجامیان ئەدەن. جا پاش ئەوەی كە خوا باسی بێ باوەڕانو سزاكانی كردن باسی باوەڕدارانو پاداشەكانیان ئەكاتو ئەفەرموێ:

(٩) بێگومان ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردووە پەروەردگاریان بەهۆی باوەڕەكانیانەوە رێنماییان ئەكات ولە پردی سیرات رزگاریان ئەكاتو ئەیانخاتە ناو بەهەشتانێكەوە كە چەندین ڕووبار لەژێر باخو بێستانەكانیانەوە ئەڕوات بەراستی ئەوان لەناو باخو بێستانە پڕنازو نیعمەتەكانداو لەهیچیان كەم نیەو بێجگە لە یادی خوای خاوەن كەرەم هیچ شتێك داواناكەن وەك ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا وَرَضُواْ بِٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَٱطۡمَأَنُّواْ بِهَا وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِنَا غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ يَهۡدِيهِمۡ رَبُّهُم بِإِيمَٰنِهِمۡۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٩﴾ دَعۡوَىٰهُمۡ فِيهَا سُبۡحَٰنَكَ ٱللَّهُمَّ وَتَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٞۚ وَءَاخِرُ دَعۡوَىٰهُمۡ أَنِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ ۞ وَلَوۡ يُعَجِّلُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ ٱلشَّرَّ ٱسۡتِعۡجَالَهُم بِٱلۡخَيۡرِ لَقُضِيَ إِلَيۡهِمۡ أَجَلُهُمۡۖ فَنَذَرُ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿١١﴾ وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ٱلضُّرُّ دَعَانَا لِجَنۢبِهِۦٓ أَوۡ قَاعِدًا أَوۡ قَآئِمٗا فَلَمَّا كَشَفۡنَا عَنۡهُ ضُرَّهُۥ مَرَّ كَأَن لَّمۡ يَدۡعُنَآ إِلَىٰ ضُرّٖ مَّسَّهُۥۚ كَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِلۡمُسۡرِفِينَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٢﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٣﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰكُمۡ خَلَٰٓئِفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لِنَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ﴿١٤﴾

(١٠) داواكاری ئەوانو بەندایەتیان تەنها ئەوەیە كە ئەڵێن: پاكو بێ عەیبی هەربۆ خودایەو چاكو چۆنی نێوان خۆیانو پەروەردگاریانو خۆیانو فریشتەكان: هەرسەلام سەلامەودوا وتەیشیان ئەوەیە كەئەڵێن: سوپاس بۆﷲ كە پەروەردگاری هەمو عالەمەو هیچی لە بیر نەچوەو بژێوی بەهەمویان ئەدات. ئینجا دەفەرموێ:

(١١) خۆ ئەگەرﷲ بۆ تۆڵەی خراپە لەخەڵك پەلەی بكردایە وەكو پەلەی خۆیان بۆماڵی دنیا دەمێك بو لەناو چووبون، بەڵام خوا بەرەحمەو ماوە بەبەندە ئەدات بەڵكو بیر بكاتەوە ئەگەر چی خەریكی خراپەكاریش بن وەك ئەفەرموێ: ئێمە مۆڵەت ئەدەین بەو كەسانەی كەناترسن لە تۆڵەی ئەورۆژەی كە پێمان دەگەن تا لە تاوانو خراپەی خۆیاندا زیاتر بێ ئاگا ببنو كوێڵی خۆیان قورستر بكەن. واتە پێویستە باوەڕداران ئەم راستیە بزاننو بەنازو نیعمەمەتو هێزی دەسەڵاتداران سەرسام نەبن، چونكە خوا ئەیەوێ زیاتر باریان قورس بكات وەك لە ئاخری سورەتی (ئالی عیمران)دا باسی فەرمون، ئینجا خوا باسی لاوازی مرۆڤ ئەكاتو ئەفەرموێ:

(١٢) خۆ هەر كاتێك مرۆڤ دوچاری زیانی ماڵی یان لاشەیی هات زوو بێ ئارام ئەبێو هاوارمان بۆدێنێ بەراكشاویو بەدانیشتوییو بەپێوەو دەپاڕێتەوەكە رزگاری بكەین وئەو نارەحەتیو زیانەی

وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَاتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا ٱئۡتِ بِقُرۡءَانٍ غَيۡرِ هَٰذَآ أَوۡ بَدِّلۡهُۚ قُلۡ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أُبَدِّلَهُۥ مِن تِلۡقَآيِٕ نَفۡسِيٓۖ إِنۡ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَيَّۖ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنۡ عَصَيۡتُ رَبِّي عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ (١٥) قُل لَّوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا تَلَوۡتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ وَلَآ أَدۡرَىٰكُم بِهِۦۖ فَقَدۡ لَبِثۡتُ فِيكُمۡ عُمُرٗا مِّن قَبۡلِهِۦٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ (١٦) فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوۡ كَذَّبَ بِـَٔايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ (١٧) وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُمۡ وَلَا يَنفَعُهُمۡ وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ قُلۡ أَتُنَبِّـُٔونَ ٱللَّهَ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (١٨) وَمَا كَانَ ٱلنَّاسُ إِلَّآ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ فَٱخۡتَلَفُواْۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡ فِيمَا فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ (١٩) وَيَقُولُونَ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ فَقُلۡ إِنَّمَا ٱلۡغَيۡبُ لِلَّهِ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُنتَظِرِينَ (٢٠)

لەسەر لابەین کەچی کاتێ کە ئەو زیانەمان لەسەر لابرد نەك هەرسوپاسمان ناکات بەڵکو وادەجوڵێتەوە وەك ئەوەی کەئەو هەرگیز هاواری بۆ ئێمە نەهێنا بێت لەو زیانەی کە توشی بوە، جا هەربەو چەشنەی کەئەو چاکەی لەبیر ئەچێتەوە جوان ئەکرێت بۆ زیادە ڕەوکاران ئەو هەڵوێستو کردارە ناشیرینانەی کە ئەنجامیان ئەدەن. واتە زۆر بەزوویی چاکەکانی خوای خۆی لەبیر ئەباتەوەو پەندو ئامۆژگاری لەو ژیانە وەرناگرێت، بەڵێ مرۆڤ هەمو بەو شێوەیەن بێجگە لەوانەی کە خوای میهرەبان ڕێنمایی کردون و ڕێگای ڕاستیان هەڵبژاردوەو خۆیان لە تاوانو خراپەکاری پاراستوە ئەمانە چ خۆشییان دەست کەوێت چ ناخۆشی یەخەیان بگرێت هەرلە خێرو چاکەو بەختەوەریدان وەکو پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ئەفەرموێ:{عَجَبًا لِأمر الْمُؤْمِنِ إن أَمْرَهُ كُلَّهُ خَيْرٌ وَلَيس ذَاكَ لِأَحَدٍ إلا لِلْمُؤْمِنِ إنْ أَصَابَتْهُ سَراءُ شَكَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ وَإِنْ أَصَابَتْهُ ضَراءُ صَبَرَ فَكَانَ خَيْرًا لَهُ / مسلم / سەیرە کاری باوەڕدار خوا هیچ شتێکی بەسەردا نادات مەگەر ئەو شتەببێ بەمایەی خێر بۆی، ئەگەر خۆشی پێگەیشتو سوپاسی کرد چاکەی بۆ دەنوسرێت، وەئەگەر زیانی پێگەیشتو خۆی گرت ئەوەلەسەر ئەو زیانە چاکەی بۆ دەنوسرێت، وە ئەمە تەنها بۆ باوەڕدارە نە کەسی تر}

ئینجا خوای میهرەبان بەسەرهاتی گەلانی پێشومان بۆ باس ئەکاتو ئەفەرموێ:

(١٣) بەراستی ئێمە چەندین گەلمان لەپێش ئێوەدا لەناوبرد لەبەر ئەوەی کەستەمیان کردبو لەحاڵێکدا کەنێرراوەکانی ئێمە بەبەڵگەی ڕوونو ئاشکرا هاتنەلایانو ڕاستیان بۆ ڕۆشنکردنەوە کەچی ئەوان باوەڕیان پێ نەکردن جاهەرچۆن ئەوگەلانەی لەناوبرد ئەفەرموێ هەرئاوەها لەهەمو کاتدا تۆڵە لەتاوانباران وەرئەگرین، واتە نەکەن ئێوەش وەك ئەوان ڕەفتار بکەن دڵنیابن کە وەکو ئەوانتان لێ دەکەین.

(١٤) لەپاشا ئەی ئوممەتی محمد ﷺ پاشئەوان ئێوەمان کرد بەجێنشینیان. بۆچی؟ تا تەماشابکەینو ببینین کە چۆن هەڵسو کەوت دەکەن. جا ئیتر ئێوەش چۆن ئیش ئەکەن بیکەن ئەوە ڕەوشتی ئێمەیە سەبارەت بە چاکەکارو تاوانبارو دڵنیاشبن کە ڕەوشتی ئێمە ناگۆڕێت لەکام دەستەبن بەوشێوەیە کەلە پێشەوە باسکرا ڕەفتارتان لەگەڵدا ئەکرێت، بەراستی ئێرە جێگەی وەستانو بیرکردنەوەیە.

(١٥) ئەی محمد ﷺ ئەم ئەممەتەی تۆ کاتێك کە ئایەتە ڕۆشنو ئاشکراکانی ئێمەیان بەسەردا ئەخوێنرێتەوە لەباتی باوەڕهێنان ئەوکەسانەی کەترسی گەیشتن بە ئێمەیان نیە ئەڵێن: ئادەی خوێنراوێکی تری بێجگە لەم قورئانەمان بۆ بهێنە یان ئەمە بگۆڕە، چاکەی بکە بەخراپەو خراپەی بکە بەچاکە، ئەی محمد ﷺ پێ یان بڵێ : ناتوانم لەخۆمەوە ئەو ئایەتانە بگۆڕم بەڵکو ئەمە نیگای خوایەو من پەیڕەوی ناکەم لە هیچ شتێك بێجگە لەوەی کەبۆم دێت بێگومان من ئەترسم ئەگەر بێتو بێ فەرمانی خوای خۆم بکەم لەسزای ڕۆژێکی زۆر گەورە واتە من هەرگیز سەرپێچی لەفەرمانی خوای خۆم ناکەم.

(١٦) پێ یان بڵێ: ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بوایە منی نەئەکرد بە پێغەمبەر تا ئەم قورئانە بخوێنمەوە بەسەر ئێوەداو من هیچم بەئێوە نەدە گوت، خۆتان ئەزانن کەمن ماوەی زیاتر لە چل ساڵ لەناو ئێوەدا ژیاوومو هیچ قسەیەکی ئاوەهام نەکردوە چونکە ئەو کاتە پێغەمبەر نەبوم ئێستا فەرمانم بۆ هاتوە ئایا ئێوە هۆشو بیر بەکارناهێنن؟! بۆ ئەوەی ڕاستیەکان بزانن‌ولەم نەزانی‌ونەفامییە ڕزگارتان ببێت؟ ئینجا ئەفەرموێ:

(١٧) کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە درۆ بەدەم خوداوە بکات یان بێ باوەڕبێت بەئایەتەکانی ئەو بێگومان ئەبێ بزانن هەرگیز تاوانباران ڕزگارنابن.

(١٨) جا ئەوانەکە بێجگە لەﷲ بەندایەتی شتێ ئەکەن کە ناتوانێ نەزیانیان پێ بگەیەنێو نەسودیان پێ بداتو ئەڵێن: ئائەمانە تکامان بۆ ئەکەن لەلای خواو ئەبنە دۆستو پاڵپشتمان محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەی ئایە ئێوە هەواڵی شتێك بەخودا دەدەن کە خوا خۆی هیچ زانیاریەکی لەبارەیەوە نیە نەلە ئاسمانانو نەلە زەویدا؟! چونکە ئەو ئەفەرموێ: من هاوبەشم نیە. ئێوە ئەڵێن: هەیەتی ئایا ئێوەراست ئەکەن یان خودا ئاشکرایە کەئەو زاتە پاکو بێ عەیبەو بەرزو بێ نیازە لەو هاوبەشانەی کە ئێوە بۆی دائەنێن بەراستی ئێوە درۆ ئەکەن. ئەمە دەمکوتێکی توندە بۆ ئەوانەی کە وائەزانن بێجگە لە خوا بەبێ ماوەدانی زاتی حەق کەسێکی تر لە رۆژی قیامەتدا ئەتوانێ چاکە یان خراپە سەبارەت بەمرۆڤ بکاتو ئەو بۆ چونە پوچەڵ دەکاتەوەو پەیڕەوانی بە نەزانو تاوانبار لەقەڵەم دەدات.

(١٩) ئەم خەڵکە لەپێشەوە بێجگە لەوەی کە هەموویان یەك گەلو خاوەنی یەك رێبازو ئایین بوون شتێکی تر نەبوون هەندێك ئەڵێن: تا سەردەمی نوح پێغەمبەر ؑ بەسەدان پشتی ئەم مرۆڤە ئەهلی تەوحیدویەکخواناسیبوە، جا لەپاشدا نارێکی کەوتەناویانەوەو بەش بەشبوون هەندێك خواپەرستو هەندێك دژی خواو رویان کردە بت پەرستیو تاوان ئینجا خوای میهرەبان پێغەمبەرانی بۆ رەوانەکردن تا راستو چەوت لەیەك جیابکەنەوەو دەفەرموێ: خۆئەگەر بڕیاری خوا پێش نە کەوتایە کە هەر کەسێك ماوەیەکی دیاری کراوی خۆی هەیەو ئەو ماوە ئەبێ تەواو بکات هەر زۆر زوو ئیشیان تەواو ئەکراو سزای ئەوشتەیان دەبینی کەتێیدا نارێکن، واتە خوا پەلەی نیە لەتۆڵە وەرگرتنەوەدا بەڵکو بۆ هەمو کەسو گەلو وڵاتێك ماوەیەکی داناوەو هەرچی بکەن هەرماوەیان پێ ئەدات تا ئەوکاتە تەواو دەبێت.

(٢٠) جا ئەڵێن ئەگەر راست ئەکات دەی با لەلایەن پەروەردگاریەوە بەڵگەیەکی بۆ بهاتایە وەکو حوشترەکەی ساڵح یان عەساکەی موسا ئیتر بێ هۆشو نەزانو ناڵێن کابرایەك کە تا تەمەنی چل ساڵی دەرسێکی نەخوێندوەو دێڕە خەتێکی نەنوسیوە ئەی ئەم قورئانەی لەکوێ هێناوە کە هەمو زانایان سەرسامن لەودا، ئینجا ئەفەرموێ دەی پێان بڵێ: ئەونهێنیە هەرلەلای ﷲ ، جا هاتنی بەڵگەو نەهاتنی بەدەست خۆیەتی کەوابو چاوەڕێ بکەن منیش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕێ ئەکەم تا بزانین چی ڕوئەدات، من تەنها ئایەتەکانی خواتان بۆ ئەخوێنمەوەو بێجگە لەوەش هیچ ئیشێکی ترم پێ نەسپێردراوە.

وَإِذَآ أَذَقۡنَا ٱلنَّاسَ رَحۡمَةٗ مِّنۢ بَعۡدِ ضَرَّآءَ مَسَّتۡهُمۡ إِذَا لَهُم مَّكۡرٞ فِيٓ ءَايَاتِنَاۚ قُلِ ٱللَّهُ أَسۡرَعُ مَكۡرًاۚ إِنَّ رُسُلَنَا يَكۡتُبُونَ مَا تَمۡكُرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُسَيِّرُكُمۡ فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۖ حَتَّىٰٓ إِذَا كُنتُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَرَيۡنَ بِهِم بِرِيحٖ طَيِّبَةٖ وَفَرِحُواْ بِهَا جَآءَتۡهَا رِيحٌ عَاصِفٞ وَجَآءَهُمُ ٱلۡمَوۡجُ مِن كُلِّ مَكَانٖ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ أُحِيطَ بِهِمۡ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ لَئِنۡ أَنجَيۡتَنَا مِنۡ هَٰذِهِۦ لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٢٢﴾ فَلَمَّآ أَنجَىٰهُمۡ إِذَا هُمۡ يَبۡغُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّۗ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَا بَغۡيُكُمۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۖ مَّتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُكُمۡ فَنُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٢٣﴾ إِنَّمَا مَثَلُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ مِمَّا يَأۡكُلُ ٱلنَّاسُ وَٱلۡأَنۡعَٰمُ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذَتِ ٱلۡأَرۡضُ زُخۡرُفَهَا وَٱزَّيَّنَتۡ وَظَنَّ أَهۡلُهَآ أَنَّهُمۡ قَٰدِرُونَ عَلَيۡهَآ أَتَىٰهَآ أَمۡرُنَا لَيۡلًا أَوۡ نَهَارٗا فَجَعَلۡنَٰهَا حَصِيدٗا كَأَن لَّمۡ تَغۡنَ بِٱلۡأَمۡسِۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱللَّهُ يَدۡعُوٓاْ إِلَىٰ دَارِ ٱلسَّلَٰمِ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٢٥﴾

(٢١) جا هەر کاتێك مرۆڤ پاش زیانو ناخۆشیە کەچەشتویانە نیعمەتی خۆمان برژێنین بەسەریانداوتامی خۆشی بکەن بەزوویی ئەو ئازارو ناخۆشیانەی کە پێیان گەیشتوە لەبیر خۆیان ئەبەنەوەو لە جیاتی سوپاسو پێ زانین گاڵتە بە بەڵگەکانی ئێمەئەکەنو بێ باوەڕئەبن بەونیشانانە، جاپەروەردگاریش دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ: ئەی محمد ﷺ بڵێ خوا زیاتر ئێوە دەخەڵەتێنێ بەماوە پێدانتان لەسەر خراپەو تاوان، چونکە بێگومان نێرراوەکانی ئێمە، ئەو فریشتانەی کە مەئمورن بۆ نوسینی کردەوەکانی ئینسان ئەو هەمو فروفێڵ وتاوانانەی کە سەبارەت بەئایینو پەیڕەوانی ئەنجامیان دەدەن دەینوسنو لەپاشەرۆژدا تۆڵەیان ئەبینن. دیسان خوا سیفەتێکی تری مرۆڤی بێ باوەڕ باس ئەکاتو ئەفەرموێ:

(٢٢) ﷲ ئەو زاتەیە کەهێزی هاتو چۆو گەڕان بەدەشتو دەرو ناودەریا بەئێوە دەدات، هەروەك لە وشکانیدا هاتوچۆ ئەکەن هەروا لەناو دەریاکانیشدا هاتوچۆ ئەکەنو خۆی ئەتان سورێنێتەوەو ئەتان پارێزێ تا ئەو کاتەی کەلەناو کەشتیا ئەبنو بایەکی باش وەکو پاڵنەری کەشتیەکە دێتو بەو خۆشحاڵ دەبن کتو پڕ وەزعتان لێ ئەگۆڕێو بایەکی توند دێتو شەپۆلی دەریا لەهەمو لایەکەوە روتان تێ دەکاتو دەکەونە مەترسیەوەو گومان ئەکەن کە تازەرزگار نابنو لەناودەچن جالەو کاتەدا هاوار ئەکەنە خواو بۆئەو خۆتان یەك لادەکەنەوەو ئەزانن کە بێجگەلەو هیچ

۞ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَسَبُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ جَزَآءُ سَيِّئَةِۭ بِمِثْلِهَا وَتَرْهَقُهُمْ ذِلَّةٌۖ مَّا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍۖ كَأَنَّمَآ أُغْشِيَتْ وُجُوهُهُمْ قِطَعًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مُظْلِمًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢٧﴾ وَيَوْمَ نَحْشُرُهُمْ جَمِيعًا ثُمَّ نَقُولُ لِلَّذِينَ أَشْرَكُواْ مَكَانَكُمْ أَنتُمْ وَشُرَكَآؤُكُمْۚ فَزَيَّلْنَا بَيْنَهُمْۖ وَقَالَ شُرَكَآؤُهُم مَّا كُنتُمْ إِيَّانَا تَعْبُدُونَ ﴿٢٨﴾ فَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ إِن كُنَّا عَنْ عِبَادَتِكُمْ لَغَٰفِلِينَ ﴿٢٩﴾ هُنَالِكَ تَبْلُواْ كُلُّ نَفْسٍ مَّآ أَسْلَفَتْۚ وَرُدُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ مَوْلَىٰهُمُ ٱلْحَقِّۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٣٠﴾ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَمَن يُخْرِجُ ٱلْحَيَّ مِنَ ٱلْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ ٱلْمَيِّتَ مِنَ ٱلْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ ٱلْأَمْرَۚ فَسَيَقُولُونَ ٱللَّهُۚ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾ فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلْحَقُّۖ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ حَقَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ فَسَقُوٓاْ أَنَّهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٣﴾

کەسێك بەدەمتانەوە نایەتو خۆتان بەبەندەی چاكو پاك پیشان ئەدەن ودەڵێن: ئەگەر خوا لەم ناڕەحەتیە رزگارمان بكات بەراستی ئێمە لەبەندە سوپاسگوزارەكانی خودا ئەبین.

﴿٢٣﴾ جا لەكاتێكدا كەﷲ رزگاریان ئەكات هەر زۆر بەزوویی بەناڕەوا لەزەویدا خراپەوتاوان ئەكەنو تەنگو چەڵەمەی پێشوی خۆیان لەبیر ئەچێتەوە، بەڵام خوای میهرەبان جارێكی تر بانگیان ئەكاتو لە ئاكامی خراپەو تاوانەكانیان ئاگاداریان ئەكاتەوەو دەفەرموێ: ئەی خەڵكینە بەراستی تاوانو دەست درێژی ئێوە زیانەكەی تەنها بۆخۆتانە كە كەمێك لەزەت وەرگرتنە لەدنیاداو هیچی تر بەڵام لەپاشدا بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە پێتان خۆشبێت یان نە، ئەوسا ئێمە هەواڵی تۆڵەی ئەوشتانەی كەكردوتانە پێتان دەگەیەنیین. پاشان ﷲ وێنەیەكی ژیانی دنیامان بۆباس دەكاتو ئەفەرموێ:

﴿٢٤﴾وێنەی ژیانی دنیا وەك ئەو بارانەیە كەئێمەلە ئاسمانەوە رەوانەمان كرد بێتو تێكەڵاو بەزەوی بوبێتو دانەوێڵەكانی سەوز كرد بێت لەوانەی كە هەندێكی خەڵكو مەڕوماڵات دەیخوات تا ئەوكاتەی كەزەوی جوانو ڕازاوەو نەخشین ئەبیٚو خەڵكی زەوی دڵنیا ئەبن كە بە تەواوی تواناییان هەیە بۆ سودلێ وەرگرتنو درەوكردنی لەوكاتەدا فەرمانی لەناوچونی لەلایەن ئێمەوە بۆ دەرچوبێت شەو یان ڕۆژ جاوەك درەو كراوی لێ بكەینو لەناوی ببەین وەك ئەوەی كە دوێنیٚ هیچی تێدا نەبوبێت، جا ئەفەرموێ: هەرئاوەها چۆن ئەم باسەی ژیانی دنیامان بۆئێوەكرد هەروا بەڵگەكانی خۆمان ڕۆشن ئەكەینەوە بۆ ئەوگەلەی كەبیر ئەكاتەوە. واتە:چۆن ئەو زەوییە بەو گژووگیایەو بەو ئاوە زوو گەشو جوان بو بەڵام كوتو پڕیش لەناو چوو هەر ئاوایەشە ژیانی ئێمەی خۆڵەبیرچوو، ئەگەر چی ئەم باسانە بۆ هەمو نەوەی ئادەمە بەڵام تەنها ئەوانە سودی لیٚ وەرئەگرن كەبیری لیٚ ئەكەنەوە بۆیە لەزۆر جێگادا ئاوا دەفەرموێ، ئینجا ئەفەرموێ:

﴿٢٥﴾ ﷲ بانگتان ئەكات بۆ خانوی بیٚ زیانو ئاسایش كە بەهەشتەو ڕێنمایی ئەكات ئەوكەسەی ئارەزۆی لیٚ بێت بۆڕێگای راستی خۆی. واتە ﷲ توانای هەمو شتێكی هەیەو ڕێنمایی‌و سەرلیٚ شێوانیش هەربەدەستی خۆیەتی‌و مرۆڤ هۆیەكەو هیچی تر.

پێغەمبەرﷺ سەبارەت بەسیرات دەفەرموێ: {إن ا ضَرَبَ مَثَلًا صِرَاطًا مُسْتَقِيمًا عَلَى كَنفَيْ الصرَاطِ زُورَان لَهُمَا أَبْوَابٌ مُفَتحَةٌ عَلَى الْأَبْوَابِ سُتُورٌ وَدَاعٍ يَدْعُو عَلَى رَأسِ الصرَاطِ وَدَاعٍ يَدْعُو فَوْقَهُ وَاللهُ يَدْعُوا إِلَى دَارِ السلَامِ وَيَهْدِي مَنْ يَشَاءُ إِلَى صِرَاطٍ مُسْتَقِيمٍ وَالْأَبْوَابُ التِي عَلَى كَنفَيْ الصرَاطِ حُدُودُا فَلَا يَقَعُ أَحَدٌ فِي حُدُودِا حَتى يُكْشَفَ الستْرُ وَالذِي يَدْعُو مِنْ فَوْقِهِ وَاعِظُ رَبهِ /الترمذي،صححه الالبا /

بێگومانﷲ وێنەیەك دەهێنێتەوە بەرێگایەكی راست كە لە هەردوولای ئەو رێگاوە دوو دیوار هەبێت كە چەندین دەرگای كراوەی هەبێت كە چەندین پەردە بەسەر ئەو دەرگایانەوە بێتو بانگ كەرێك لەسەری ئەو رێگاوە بێتو بانگ كەرێكیش لەسەرەوەی بێت كە بانگ بكاتوبلێ:ﷲ بانگتان دەكات بۆ بەهەشتو ئەو كەسەی كە ئارەزۆی لیٚ بێت رێنمایی ئەكات بۆ رێگای راستو ئەو دەرگانەی كە لە ئەم لاو ئەولای رێگاكەیە سنورەكانی ﷲ یە ئەوسا هیچ كەسێك ناكەوێتە ناوسنورەكانەوەوكاری بیٚ شەرعی بۆناكرێت تا پەردەكان لانەدرێتو ئەوبانگ كەرەی كە لەسەر سەرەوەی رێگاكەیە ئامۆژگاری كەری لایﷲ یە}

جا سەبارەت بەپاداشی چاكەكاران ئەفەرموێ:

﴿٢٦﴾ بۆ ئەو كەسانەی كە چاكە ئەكەن چاكتر لە چاكەكەی خۆیانیان پیٚ ئەدرێتو زیاتریش. بەڵیٚ بەراستی چاكە لە دە بەرامبەرەوە تا حەوسەد بەرامبەرو زیاتریش هەیە لەلایەن خوداوە بۆ بەندەكانی، وەدەمو چاوو ڕوەكانیان لەو ڕۆژەدا دوچاری تەپ وتۆزو كزی نابیٚ ئائەوانە رەفیقی بەهەشتنو بۆ هەمیشە لەناویدا دەمێننەوە.

له سوههیبی رۆمیەوە رەزای خوای لێ بێ له پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کە فەرمویەتی: { إذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنةِ الْجَنةَ قَالَ يَقُولُ ا ُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنةَ وَتُنَجِّنَا مِنَ النارِ قَالَ فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنَ النظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ - و رواية- ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ لِلذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ /رواه مسلم وغ ه/ هەر کاتێ خەڵکی بەهەشت چونە بەهەشتەوە خوای بێ نیازو بالآدەست ئەفەرموێ: شتێکی ترتان ئەوێ بۆتان زیاد بکەم، جا ئەوانیش ئەڵێن: ئایا تۆ رووی ئێمەت سپی نەکردوە؟ ئایا ئێمەت نەخستوەتە ناو بەهەشتەوەو رزگارت نەکردوین لە ئاگر؟ واتە: چیمان دەوێ لەوە زیاتر؟ ئەفەرموێ : خوا پەردەی نێوان خۆیو بەندەکانی لائەداو پەوەردگاری خۆیان ئەبینن_جا ئەفەرموێ: سەرەڕای ئەوهەمو نازو نیعمەتەی بەهەشتو دوریان لەسزای دۆزەخ_هیچ شتێك نیە خۆشەویست تر بێت لەلای ئەوان لە بینینی پەروەردگاری بەهێزو گەورەی خۆیان - لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە کەلە پاش ئەم فەرمودەیە - ئەم ئایەتەی خوێندەوە(لِلذِينَ أَحْسَنُوا الْحُسْنَى وَزِيَادَةٌ /بۆئەوانەی کە چاکەیان کردوە چاکتریان پێ ئەدرێت کەبەهەشتەو زیاتریش).

ئینجا ﷲ سەبارەت بە خراپەکارانو سزاکانیان ئەفەرموێ:

(٢٧) جا ئەو کەسانەی کە ئیشی خراپەیان کردووە جەزای خراپە بەوێنەی خۆیەتیو هیچی لەسەر زیاد ناکات بەڵێ خوا بۆ ئیمانداران فەزڵ بەکاردەهێنێت بەڵام بۆ کافران داد، وەئەوان دووچاری خواریو زەلیلی دەبن کە بۆ ئەوان لەلایەنی خواوە هیچ پارێزەرێك نیە کە بیان پارێزێت لە تۆڵەو رقیﷲ، لەو رۆژەدا دوچاری تەپو تۆزو روورەشیەکی وائەبن وەك ئەوەی کەدەموچاویان پارچەیەك بێت لە شەوێکی تاریك ئا ئەوانە رەفیقی ئاگرنو ئەوان لەناویدا بۆ هەمیشە ئەمێننەوە. ئینجا ﷲ دەنگو باسێکی کۆکردنەوەو وەڵامی بێباوەڕانمان بۆ باس ئەکات بۆ ئەوەی تا نەمردوین بیرلەو رۆژە بکەینەوەو خۆمان لەتاوانو بێ باوەڕی بپارێزینو ئەفەرموێ:

(٢٨) بیر بکەرەوە لەو رۆژەی کە هەمویان کۆ ئەکەینەوە لەپاشدا بەوانەی کە هاوبەشیان بۆ خودا داناوە دەڵێین:

(٢٩) لەجێگای خۆتاندا بوەستن خۆتانو هاوبەشەکانتان جا ئەو دۆستایەتیەی دنیایان لە نێواندا لا ئەبەینو ئەبن بەدوژمنی یەکتر، وە هاوبەشەکانیان ئەڵێن نەخێر ئێوەدرۆ ئەکەن ئێمەتان نەپەرستوە، بەڵام ئەم قسەیە هیچ سودێکی نیە چونکە هەردووکیان تاوانبارنو خوا ئاگای لە هەردوولایە.

(٣٠) جا بەسە خوا خۆی شایەت بێت لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بەبێگومان ئێمە بێ ئاگاین لەبەندایەتیتان بۆمان،

(٣١) ئالەورۆژەدا هەر نەفسێك چی کردوە بۆی ئاشکرا دەبێتو ناتوانێ حاشای لێ بکات وەهەر نەفسێك پەیڕەوی لەچی کردوە لەو رۆژەدا دوای ئەوە ئەکەوێت، وەك لە پێغەمبەرمانەوە ﷺ هاتوە کە ئەفەرموێ: {كَذَلِكَ يَجْمَعُ ا الناسَ فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتْبَعْهُ فَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشمْسَ وَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ وَيَتْبَعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطوَاغِيتَ.../رواه الشيخان/ جا هەر ئاوەهاﷲ هەمو خەڵك کۆدەکاتەوە ئینجا دەفەرموێ: هەر کەسێك هەرچی پەرستووە، جا با دوای کەوێت، ئەوسا ئەو کەسەی رۆژی پەرستوە دوای رۆژ دەکەوێتو ئەو کەسەی کە مانگی پەرستوە دوای مانگ دەکەوێت، وەئەوەیش کە تاغوتەکانی پەرستوەو پەیڕەوی لێکردون لەو رۆژەدا دوای ئەوان دەکەوێت..}

واتە: هەر کەسێك هەرچی پەرەستوە لە دنیاداو پەیڕەوی لێکردوە دوای ئەوە دەکەوێت، بەڵێ بەراستی ئەو رۆژە رۆژی ئایینە(ألدين)، چیت پەرستوە لە دنیادا لەدوارۆژدا هەرلەسەر ئەوە زیندو دەکرێیتەوەو هەر بەشوێن ئەویشدا دەڕۆیت، جا سەرشۆڕیو ماڵ وێرانی بۆ ئەوانەی کەپەیڕەوی بێجگە لە (ﷲ)یان کردبێ بۆ کوێ دەچنو کێ رزگاریان دەکات؟ بەڵێ ئەوانە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا کە سەرپەرشتی راستەقینەیانەو بەگوێرەی کردەوەی خۆیان پاداشت وەردەگرن، وەئەو درۆو دەلەسانەی کەلە دنیادا کردویانە هەمویان لێ ون دەبێتو توانای پارێزگاری لە خۆیانیان نابێت. ئینجا ﷲ هەندێك لەبەڵگەی دەسەڵاتو هێزی خۆی ئەخاتە روو دەفەرموێ:

(٣٢) ئەی محمدﷺ بڵێ: کێ لەئاسمانو زەویدا رۆزی بەئێوە دەدات کە لەئاسمانەوە باران ئەبارێنێو زەوی شین ئەکاتو ئەبێ بەهۆی ژیان بۆئێوە؟ یان کێ خاوەنی بیستنو بینینە بۆ ئێوەو کێ ئەو دوو هێزە گرنگەی بەئێوەداوە؟ وەکێیە کە زیندو لەمردو پەیدا ئەکاتو مردویش لە زیندو؟ مرۆڤ لە ئاوێکی مردوی بێگیانو باڵندەش لەهێلکەو پێچەوانە کەشی، وەکێیە کارو باری ئەم بوونەوەرە ئەسوڕێنێ؟ بەراستی ئەمانە شتانێکن تەنها لە توانای خوادایە، خۆ بەم زوانە ئەوانیش هەردەڵێن:ﷲ ئەوانە ئەنجام ئەدات دەبڵێ: ئایا ئێوە ناترسن لەوﷲ یەو خۆتان لەرقو قینی ئەوناپارێزن؟ بلێ:

(٣٣) ئائەوەی کەئەو شتانە دەکات پەروەردگاری راستەقینەتانەو پاش راستیو حەقیقەتیش جگەلە گومڕاهی هیچ شتێکی ترنیە،

قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَبْدَؤُاْ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣٤﴾ قُلْ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ ۚ قُلِ ٱللَّهُ يَهْدِى لِلْحَقِّ ۗ أَفَمَن يَهْدِىٓ إِلَى ٱلْحَقِّ أَحَقُّ أَن يُتَّبَعَ أَمَّن لَّا يَهِدِّىٓ إِلَّآ أَن يُهْدَىٰ ۖ فَمَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٥﴾ وَمَا يَتَّبِعُ أَكْثَرُهُمْ إِلَّا ظَنًّا ۚ إِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغْنِى مِنَ ٱلْحَقِّ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَا كَانَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ أَن يُفْتَرَىٰ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا رَيْبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُواْ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ بَلْ كَذَّبُواْ بِمَا لَمْ يُحِيطُواْ بِعِلْمِهِۦ وَلَمَّا يَأْتِهِمْ تَأْوِيلُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣٩﴾ وَمِنْهُم مَّن يُؤْمِنُ بِهِۦ وَمِنْهُم مَّن لَّا يُؤْمِنُ بِهِۦ ۚ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٤٠﴾ وَإِن كَذَّبُوكَ فَقُل لِّى عَمَلِى وَلَكُمْ عَمَلُكُمْ ۖ أَنتُم بَرِيٓـُٔونَ مِمَّآ أَعْمَلُ وَأَنَا۠ بَرِىٓءٌ مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٤١﴾ وَمِنْهُم مَّن يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ وَلَوْ كَانُواْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿٤٢﴾

دەی ئیتر بۆ خۆتان لادەدەن لەوهەمو بەڵگە راستو دروستانەو سەرلەخۆتان دەشێوێنن؟!!

(٣٤) هەر ئاوەها چۆن ئەوتاوانبارانە نایانەوێ لەخراپەو هاوبەشی دانان بگەڕێنەوە هەربەو شێوەیەش بڕیاری خوای تۆ لەسەر ئەوان هاتەدی کە ئەوانە باوەڕناهێنن. واتە خۆیان هۆی بەدبەختی خۆیانن.

(٣٥) ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ: ئایا لەو هاوبەشانەی کە دایانناوە هەیانە کە بتوانێت لە سەرەتاوە کەسێ دروست بکات لەپاشدا زیندوی بکاتەوە؟ پێیان بڵێ: هەرﷲ یە کە لە سەرەتاوە خەڵك دروست دەکات کە هەر ئەویشە لە پاشانا زیندوی دەکاتەوە ئیتر ئێوە چۆن ئەو درۆو قسە پوچانە ئەکەن؟!

(٣٦) پێیان بڵێ: ئایا لەوانەی کە ئێوە داتان ناوە بەشەریکی خوا هیچیان هەیە کە مرۆڤ رێنمونی بکات بۆ رێگای راست؟ بڵێ: هەرﷲ یە کەمرۆڤ ڕێنمونی ئەکات بۆ حەقو راستی، دەی ئایا ئەو کەسەی کە رێنمونی مرۆڤ ئەکات بۆ حەقو راستی شایستەیە پەیڕەوی بکرێت یان ئەوەی کە خۆیشی هیچ نازانێ مەگەر رێنمونی بکرێت چ بەڵگەیەکتان هەیەو چۆن ئاوا بڕیارێك دەدەن؟ وەچۆن خالیقو مەخلوق یەکسان دەکەن؟!

(٣٧) خۆ زۆربەی ئەوانە پەیڕەوی لە هیچ شتێکی راستو ڕەوا ناکەن بێجگە لە گومان، بێشك گومانیش لەبەرامبەر راستیەوە هیچ دەورێك نابینێ، واتە: بیرو باوەڕ لەسەر گومان دانامەزرێت، ئینجا ﷲ هەڕەشە لەو جۆرە کەسانە دەکاتو دەفەرموێ: بێگومانﷲ زانەرە بەو ئیشانەی کە ئەوان دەیکەن. ئینجا ﷲ لەبارەی قورئانەوە دەفەرموێ:

(٣٨) ئا ئەم قورئانە قسەیەکی هەڵوەسراو نیە بەدەمی خوداوە بەڵکو ئەمە پەڕاوێکە دان دەنێت بەوەی کە لە پێش خۆیدا هاتوونو بەراستیان ئەزانێو تێت دەگەیەنێت کەهەمویان لەیەك سەرچاوەوە هاتونو محمد یشﷺ پێغەمبەری خودایەو ودرێژەدەری پەڕاوی پێش خۆیەتیو رونکەرەوەی فەرمانی ئەم قورئانەیە لە حەرامو حەڵاڵ وفەرماندانو بەرگری کردن، کە هیچ گومانێکی تێدا نیەو لەلایەن پەروەردگاری عالەمەوە هاتووە. ئینجا ﷲ ئەچێتە سەر قسەیەکی تری بێ باوەڕانو وەڵامەکەیانو ئەفەرموێ:

(٣٩) یان دەڵێن: ئەمە هەڵبەسراوەو محمد ﷺ خۆی دروستی کردوە بەناوی خوداوە، پێیان بڵێ ئەگەر هەڵبەسراوە: دەی ئێوە سورەتێك وەك سورەتی ئەم قورئانە بهێنن و هاواروبانگ بکەنە هەر کەسێکیش کەئەتوانن بێجگەلەﷲ بایارمەتیتان بدات ئەگەر راستگۆن لەوقسانەتاندا.

(٤٠) نەخێر ئەوان هەر بێ باوەڕن بەو قورئانەی کە ئەوان هیچێك لەزانیاری ئەونازانن‌و هێشتا بۆ ئەوان نەهاتوە ئەو هەڕەشانەی کەلەم قورئانەدا هەیە هەروەك ئەم کافرانەی ئێستا ئەوانەی پێش ئەمانیش پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستوە، جا تەماشاکەو بزانە چیان بەسەرهاتو چۆن بو بەسەرهاتی ستەمکاران، وەلەوانە هەندێکیان باوەڕی پێ دەکەن‌و هەندێکی تریان باوەڕی پێ ناهێنن‌و پەروەردگارت زاناترە بەوکەسانەی کەلاسارو خراپەکارن.

(٤١) جا ئەگەر ئەوان باوەڕیان نەهێنا بە تۆ ئەوسا تۆیش بڵێ: کرداری خۆم پاداشتی بۆ خۆمەو کرداری خۆتان سزاکەی بۆ خۆتانە، بەراستی ئێوە پەیوەندیتان نیە بەوەی کەمن دەیکەم‌و منیش پەیوەندیم نیە بەوەی کە ئێوە دەیکەن، تاوانی کەسمان نایەتە کۆڵی کەسمان‌و هەرکەس باری خۆی بەکۆڵ خۆیەتی. بەقسەی موجاهیدو کەلبی‌و موقاتل‌و ئینوزەید ئەم ئایتە بەئایەتی شمشێر هەڵوەشاوەتەوە.

(٤٢) ئەوسا لەوان کەسانێك هەن کەبەڕواڵەت گوێ لەتۆ ئەگرن وەکو خەڵکی تر بەڵام چونکە باوەڕیان پێت نیە هیچ سودێك لەوگوێگرتنە وەرناگرن‌و وەك کەڕ وان دەی ئایا تۆ ئەتوانی

وَمِنْهُم مَّن يَنظُرُ إِلَيْكَ ۚ أَفَأَنتَ تَهْدِي الْعُمْيَ وَلَوْ كَانُوا لَا يُبْصِرُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّ اللَّهَ لَا يَظْلِمُ النَّاسَ شَيْئًا وَلَٰكِنَّ النَّاسَ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٤﴾ وَيَوْمَ يَحْشُرُهُمْ كَأَن لَّمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّنَ النَّهَارِ يَتَعَارَفُونَ بَيْنَهُمْ ۚ قَدْ خَسِرَ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِلِقَاءِ اللَّهِ وَمَا كَانُوا مُهْتَدِينَ ﴿٤٥﴾ وَإِمَّا نُرِيَنَّكَ بَعْضَ الَّذِي نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ ثُمَّ اللَّهُ شَهِيدٌ عَلَىٰ مَا يَفْعَلُونَ ﴿٤٦﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولٌ ۖ فَإِذَا جَاءَ رَسُولُهُمْ قُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا الْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٤٨﴾ قُل لَّا أَمْلِكُ لِنَفْسِي ضَرًّا وَلَا نَفْعًا إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۗ لِكُلِّ أُمَّةٍ أَجَلٌ ۚ إِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ فَلَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴿٤٩﴾ قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَتَاكُمْ عَذَابُهُ بَيَاتًا أَوْ نَهَارًا مَّاذَا يَسْتَعْجِلُ مِنْهُ الْمُجْرِمُونَ ﴿٥٠﴾ أَثُمَّ إِذَا مَا وَقَعَ آمَنتُم بِهِ ۚ آلْآنَ وَقَدْ كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿٥١﴾ ثُمَّ قِيلَ لِلَّذِينَ ظَلَمُوا ذُوقُوا عَذَابَ الْخُلْدِ هَلْ تُجْزَوْنَ إِلَّا بِمَا كُنتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَيَسْتَنبِئُونَكَ أَحَقٌّ هُوَ ۖ قُلْ إِي وَرَبِّي إِنَّهُ لَحَقٌّ ۖ وَمَا أَنتُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥٣﴾

بەکەڕ قسە ببیسێنی لەحاڵێکدا کە ئەوان لە هیچ حاڵی نابن‌و فامی هیچ ناکەن؟

﴿٤٣﴾ خۆ لەوانە هەندێك هەن کەبەچاو تەماشای تۆ دەکەن بەلاّم دڵیان لەلایەکی ترە ئایا تۆ ئەتوانیت ڕێگا بەکوێر نیشان بدەیت لەحاڵێکدا کە ئەوان هیچ نابینن؟ بەڵێ ئەمانە ئەگەر چی چاویان هەیە بەلاّم حەق نابینن‌و وەك کوێر ڕەفتار دەکەن، واتە تۆ ناتوانی باوەڕ لەوانەدا دروست بکەیت مادام خۆیان نایانەوێ.واتە دەبێ مرۆڤ خۆی هەنگاو هەڵگرێ بەرەو ڕاستی ئەوسا چاوەڕوانی یارمەتی خوابکات،

﴿٤٤﴾ بەبێگومان کە ﷲ هیچ ستەمێك لە خەڵك ناکات کە ڕێنماییان ناکات چونکە ئەوان خۆیان لاسارن‌و هەوڵ نادەن بۆ تێگەیشتن‌و باوەڕ هێنان، وەبەراستی بەپێچەوانەوە خەڵك خۆیان ستەم لە خۆیان ئەکەن‌و لاسارانە درێژە بە بێ باوەڕی‌و تاوانکاری ئەدەن تا ڕۆژی دادگاو حیسابیان جا ئەوکاتە بیر لەم ژیانە کەمە ئەکەنەوە وەك دەفەرموێ:

﴿٤٥﴾ جارۆژی قیامەت کاتێ کە خودا کۆیان ئەکاتەوە وائەزانن کە بەشێکی کەمی ڕۆژێك نەبێ لەو دنیادا نەژیاون کەیەکتر ئەناسنەوە هەروەکو دنیا بەلاّم بێجگەلە قسەی ناشیرین بەیەك وتن‌و داخ‌و خەفەت خواردنێکی زۆر ئەو ناسینەوە هیچ سودێکی نابێ، بەراستی ڕەنجەڕۆبون ئەو کەسانەی کەبێ باوەڕ بون بەگەیشتن بە دادگایﷲ و ئەوان ڕێگای هیدایەتیان نەگرتبوو.

﴿٤٦﴾ ئەی محمد ﷺ ئەگەر تا تۆماوی لەژیاندا هەندێ لەوسزایەی کەهەڕەشەمان لێ کردون بەسەریاندا بدەین یان تۆ ببەینەوە پێش ئەوەی سزای ئەوان بدەین چاك بزانە ئەوان هەربۆلای ئێمەدێنەوەوحیسابیان لەگەڵدا دەکەین لە پاش ئەوەی کەئەم دەنگ‌و باسەت زانی چاك بزانە کەﷲ ئاگای لەو شتانە هەیە کەئەوان ئەیکەن‌و هیچی لێ پەنا نادرێت‌و گەورەو بچوکی کردارەکانیان تۆمار دەکرێت.

﴿٤٧﴾ خۆ بۆ هەمو گەلێك نێرراوێکی خودا هەبوە، جا هەر کاتێك نێرراوەکەیان هاتوەتە لاو دژایەتیان کردوە، ئەوسا لە نێوان ئەواندا بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بڕیار جێ بەجێ کراوەو لەناوبراون‌و ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت هەرچیان بەسەر دێت بەرهەمی ڕەفتاری خۆیانە. بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندە بۆئەم ئوممەتەی پێغەمبەرمان ﷺواتە: ئەگەر ئێوەش وەکو ئەوان ڕەفتاربکەن واتان بەسەر دێت، وەك ئەمرۆ خۆمان بەچاوی خۆمان دەیبینین واخەریکی خواردنی تاڵاوی کردارە ناشەرعییەکانی خۆمانین کەبێجگەلە دوژمنی دەرەوە هەرلەخۆمان سەدان دەستەو پارچەمان لێ پەیدا بوەو یەکتر سزا دەدەین وئەمەش ستەممان لێ نەکراوە بەڵکو خۆمان هۆی پەیدابونین. بەڵێ بێ باوەڕان وابون کاتێ پێغەمبەران‌و پیاوچاکان ئامۆژگاریان کردون لەباتی گوێڕایەڵی و پەشیمان بونەوە لە تاوان بەگاڵتەوە ئەڵێن: بابێت ئەو سزاو قیامەتەی کە ئێوە باسی ئەکەن وەك لەو بارەوە ئەفەرموێ:

﴿٤٨﴾ ئەڵێن: کەی ئەم سزایە دێت بۆ ئێمە ئەگەرئێوە ڕاست دەکەن؟

﴿٤٩﴾ پێیان بڵێ: من بۆ خۆیشم خاوەنی زیان‌و سود نیم مەگەر خواخۆی ئارەزۆ بکات کەبۆ هەمو نەتەوەیەك ماوەیەکی دیاری کراو هەیە هەرکاتێك ئەوماوە دیاری کراوە هات بۆیان ناتوانن یەك کات دوای بخەن‌و یەك کاتیش پێشی بخەن. واتە هاتن ونەهاتنی سزا بەدەست من نیەو تەنها خوا خۆی ئەتوانێ ئەوشتانە بکات منیش بەشەرێکم وەك ئێوە.

﴿٥٠﴾پێیان بڵێ: ئەگەر سزای ئەو زاتە شەو یان ڕۆژ هات بۆتان ئێوە چی دەکەن‌و دەتوانن چی بڵێن؟ کەوابوو تاوانباران بۆچی ئەوەندە بە پەلەن بۆ هاتنی ئەو سزایە؟ خۆ ئەوەندەنەترس نین بەڵکو باوەڕیان بەهاتنی نیە، وەك دەفەرموێ:

﴿٥١﴾ ئایاپاش ئەوەی ئەوسزا هات ئەو کاتە باوەڕی پێدەکەن؟ جا کاتێ کە سزا هات‌و هیچ چارەیان نەما ئا ئەو کاتە دەڵێن:

وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي الْأَرْضِ لَافْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ النَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ الْعَذَابَ ۖ وَقُضِيَ بَيْنَهُم بِالْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٥﴾ هُوَ يُحْيِۦ وَيُمِيتُ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٥٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَآءَتْكُم مَّوْعِظَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَشِفَآءٌ لِّمَا فِي الصُّدُورِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥٧﴾ قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا۟ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ ﴿٥٨﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ اللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى اللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ وَمَا ظَنُّ الَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى اللَّهِ الْكَذِبَ يَوْمَ الْقِيَٰمَةِ ۗ إِنَّ اللَّهَ لَذُو فَضْلٍ عَلَى النَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَشْكُرُونَ ﴿٦٠﴾ وَمَا تَكُونُ فِي شَأْنٍ وَمَا تَتْلُوا۟ مِنْهُ مِن قُرْءَانٍ وَلَا تَعْمَلُونَ مِنْ عَمَلٍ إِلَّا كُنَّا عَلَيْكُمْ شُهُودًا إِذْ تُفِيضُونَ فِيهِ ۚ وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَآءِ وَلَآ أَصْغَرَ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْبَرَ إِلَّا فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦١﴾

باوەڕمان هەیە!! جا پێیان دەوترێت ئائێستا باوەڕ ئەهێنن لە حاڵێكدا كە ئێوە لە پێشەوە پەلەی هاتنیتان دەكرد؟ واتە پەشیمان بوونەوەو دان پێدانانینی ئەوكاتە بێ سودە.

﴿٥٢﴾ لەپاشان دەوترێت بە ئەو كەسانەی كەستەمیان كردوە قسە تازە سودی نیە بچێژن سزای هەتاهەتایی، ئایا پاداش درانەوە مەگەر بەگوێرەی ئەو كردارانە بێ كەلە پێشەوە كردبووتان؟ واتە: ستەمتان لێ نەكراوەو پاداشتی كردەوەی خۆتانە ئەو سزا سەختە كە ئێستا تێیدان. ئینجا ئەفەرموێ:

﴿٥٣﴾ بەگاڵتەوە بەتۆ دەڵێن ئایا ئەم زیندوبوونەوەو پرسیارو وەڵامەی پاشە ڕۆژ ڕاستەو پاش ڕزین‌و نەمانمان زیندو ئەبینەوە؟ بڵێ: ئەرێ سوێند بەپەروەردگارم ئەوە ڕاستەو دێتەجێ‌و ئێوە ناتوانن ڕێگا لە خوا بگرن لە هێنانی ئەو ڕۆژەو زیندو كردنەوەتان، جا ئەو ڕۆژە پەشیمان ئەبنەوەو نازانن چی بكەن‌و كێ ڕزگاریان بكات‌و تەنگ‌و چەڵەمەیەكی وا ڕویان تێ ئەكات ،

﴿٥٤﴾ئەگەر بۆ هەر كەسێك كە ستەمی كردوە هەرچی لە زەویدایە موڵكی ئەوبێ، هەموی ئەدات بۆ ئەوەی لەو ڕۆژە ڕزگاری ببێ بەڵام لەو ڕۆژەدا خاوەنی یەك چڵە پوشیش نیەو ڕزگاری نابێ‌و ئەبێ تۆڵەی خۆی وەرگرێت جا كاتێك كەئەو سزایە دەبینێ پەشیمان ئەبێتەوە بەڵام پەشیمانیەكەی خۆی

ئەشارێتەوە لەبەر ئەوەی كە ناسراوانی‌و خزمانی لۆمەی نەكەن‌و تانەو تەشەری لێ نەدەن، وەحوكم ئەكرێت لە نێوانیان دا بە دادپەروەرانە، خۆ ئەوان ستەمیان لێ ناكرێت. وەدەگونجێت﴿ وَأَسَرُّوا۟ النَّدَامَةَ ﴾ واتە (**واظهروا الندامة**) بەتەواوی پەشیمانی خۆی دەر ئەخات كاتێك كە سزا دەبینێ، چونكە (**أَسَر**) لەوشە دژەكانە.

﴿٥٥﴾ ئاگاداربن ئەوەی كەلە ئاسمانان‌و زەویدایە هەموی موڵكی اللّٰه یە، ئاگاداربن بەڕاستی بەڵێنەكانیاللّٰه ڕاستەو ئەوەی كەفەرمویەتی هەمو دێنەدی‌و هیچ شتێك ناتوانێ ڕێگای هاتنە دییان لێ بگرێت بەڵام زۆربەیان ئەم حەقیقەتە نازانن كە هەرخودایە كە زیندو دەكاتەوەو هەرئەوزاتەیشە كەدەمرێنێت‌و ئێوە بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە.

﴿٥٧﴾ ئەی خەڵكینە بەڕاستی لە لایەن پەروەردگارتانەوە پەندو ئامۆژگاریتان بۆ هاتوە كە قورئانەوسارێژكەرو شیفایە بۆئەو نەخۆشیانەی كە لەناو دڵی مرۆڤەكاندا هەیە وەك دووڕوویی‌و بێ باوەڕی‌و خۆپەرستی، وەڕێ پیشاندەرو ڕەحمەتە بۆ باوەڕداران.

﴿٥٨﴾ پێیان بڵێ بەهۆی فەزڵی خوداو سۆزی ئەوزاتەیە كەئەم قورئانە بەنرخە دراوە بەئێوە، جا با بەو فەزڵ‌و ڕەحمەتەی خودا كەیفخۆش‌و شادمان بن چونكە پەیڕەوی كردنی ئەو چاكترە لەوانەی كەئێوە لەدنیادا كۆی دەكەنەوە. ئینجا ئەفەرموێ:

﴿٥٩﴾ بڵێ: پێم بڵێن ئەوەی كەاللّٰه ڕەوانەی كردوە بۆتان لەرزق‌و ڕۆزی، جا ئێوە بە ئارەزۆی خۆتان هەندێكتان لێ حەرام‌و هەندێكیشتان لێ حەڵاڵ كردوە بڵێ: ئایااللّٰه ماوەی پێ داون بەم حەڵاڵ‌و حەرام كردنە یان ئێوە درۆ بەدەم خوداوە دەكەن؟ ئاشكرایە كەاللّٰه ماوەی حەرام‌و حەڵاڵ كردنی نەداوەتە دەست مرۆڤ كەواتە درۆ دەكەن بەدەم خوداوە؟!

﴿٦٠﴾ ئەوسا ئایا دەبێ چۆن بێت لەڕۆژی قیامەتدا سزای گومانی ئەو كەسانەی كەدرۆ بەدەمی (اللّٰه)ـەوە دەكەن‌وئەبێ خۆیان گومانیان چۆن بێ سەبارەت بەو درۆو دەلەسانە؟ بێگومان كەاللّٰه خاوەنی فەزڵ‌و بەرەكەتە بۆ خەڵك‌و ماوەیان پێ ئەدا بەڵكو بیر بكەنەوە بەڵام زۆربەی ئەوان سوپاسی خوا ناكەن‌و ئەم ماوەدانە بە هیچ نازانن بەڵكو بەپێچەوانەوە بەهۆی ماوە پێ دانیانەوە زیاتر لە خوا دوور دەكەونەوەو زیاتر دژایەتی خواو ئایین‌و باوەڕداران دەكەن. ئینجا خوا دەفەرموێ:

﴿٦١﴾ تۆ لەناو هیچ كاروبارێكدا نابیو هیچ لەو پەڕاوەی خوا ناخوێنیتەوەو هیچ كردارێك ئەنجام نادەن مەگەر ئێمە ئاگادارو حازر بین لەسەرتان لەو كاتەی كە ئەتانەوێ ئەو كردارە بكەن، وە ون نابێت لە خوای تۆ بەئەندازەی گەردیلەیەك نەلە زەوی و نەلە ئاسماندا، وەنەبچوكتر لەوەیش و نەگەورەتر مەگەر هەموی لە پەڕاوی ڕۆشنكەرەوەدا هەبێ واتە هەموی تۆمار كراوەو دەبێ ئاگات لەخۆت بێ.

﴿٦٢﴾ ئاگاداربن بێگومان كە دۆستانیﷲ نە ترسیان لەسەرەو نە غەم دەخۆن، بەڵێ دۆستانی خوا هەمیشە لەناو دڵدا كەیفخۆش و شادمانن بەلوتفو نیعمەتی پەروەردگاریان و دڵخۆشن بە پاشە ڕۆژیان و ترسی پاش خۆیان نیە سەبارەت بەعائیلەو منداڵیان و دڵتەنگ نابن بۆ ڕۆیشتنیان، جا چونكە ناسینی دۆستەكانی خودا پێویستە تاراستوناراست لەیەك جیابكەینەوە، لەبەرئەوەﷲ خۆی پێناسەو وەسفی ئەو دۆستانەی خۆی دەكاتو دەفەرموێ:

﴿٦٣﴾ئەو كەسانەن كە باوەڕیان هێناوەو خۆیان لەرق و قینی خودا دەپارێزن.

پێشەوا عومەر خوای لێ ازی بێت ئەڵێ: بیستم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ كە فەرموی:{إن مِنْ عِبَادِ ا لأناسًا ما هُمْ بِأنبِيَاء وَلَا شُهَدَاءَ يَغْبِطُهُمْ الْأنبِيَاءُ وَالشهَدَاءُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِمَكَانِهِمْ مِنْ ا تَعَالَى قَالُوا يَا رَسُولَ ا تُخْبِرُنَا مَنْ هُمْ قَالَ هُمْ قَوْمٌ تَحَابوا بِرُوحِ ا عَلَى غَيْرِ أرْحَامٍ بَيْنَهُمْ وَلَا أَمْوَالٍ يَتَعَاطَوْنَهَا فَوَاللهِ إن وُجُوهَهُمْ لَنُورٌ وَإنهُمْ عَلَى نُورٍ لَا يَخَافُونَ إذَا خَافَ النَّاسُ وَلَا يَحْزَنُونَ إذَا حَزِنَ النَّاسُ وَقَرَأَ هَذِهِ الْآيَةَ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾

/ ابوداود وغ ه، صحح الالبا / بەراستی لەناو بەندەكانی خوادا كەسانێك هەن كە نە پێغەمبەرن و نە شەهید، پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ ئەخوازن لە ڕۆژی قیامەتدا لەبەر ئەو جێگایەی كەهەیانە لەلای خوای بالادەست، وترا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێمان بڵێ كێن ئەوانە و كرداریان چی بوە تا ئێمەش خۆشمان بوێن؟ فەرموی: ئەوانە گەلێكن كە یەكتریان خۆشدەوێ و محەببەتیان لەبەر خودایە نەك خزمایەتیان لەنێواندابێت یان لەبەرماڵ بەیەكتردانیان، بەخوا قەسەم بێگومان دەمو چاویان نورەو لەسەر مەنارەی نورن غەم ناخۆن ئەوكاتەی كە خەڵك غەم ئەخواتو ناترسن ئەوكاتەی كە خەڵك ئەترسێتو ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾ }

أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴿٦٢﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ ٱلۡبُشۡرَىٰ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ لَا تَبۡدِيلَ لِكَلِمَٰتِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٦٤﴾ وَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّ ٱلۡعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًاۚ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٥﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَمَا يَتَّبِعُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُرَكَآءَۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّ وَإِنۡ هُمۡ إِلَّا يَخۡرُصُونَ ﴿٦٦﴾ هُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱلۡغَنِيُّۖ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ إِنۡ عِندَكُم مِّن سُلۡطَٰنِۭ بِهَٰذَآۚ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ﴿٦٩﴾ مَتَٰعٞ فِي ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ إِلَيۡنَا مَرۡجِعُهُمۡ ثُمَّ نُذِيقُهُمُ ٱلۡعَذَابَ ٱلشَّدِيدَ بِمَا كَانُواْ يَكۡفُرُونَ ﴿٧٠﴾

﴿٦٤﴾ئەمانە لەدنیادا مژدەی چاكیان بۆ هەیەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەر مژدەی خۆشیان بۆ هەیە كە بەهەشتە كە بڕیاری خوا ناگۆڕێت ئەمەی كەباسكرا بڕیاری خودایەو پادشتی ئەوانە، بەراستی ئا ئەمەیە بەهرەی گەورە.

لە پێغەمبەر ﷺ پرسیار كرا مژدەی دنیایان چی یە؟ فەرموی: {الرُّؤْيَا الصالِحَةُ يَرَاهَا الْمُسْلِمُ أَوْ تُرَى لَهُ/صحح الالبا / مژدەی دنیایان خەوی چاكە خۆی ئەیبینێ یان پێوەی ئەبینن}.

﴿٦٥﴾ باقسەی ئەوان تۆ غەمبار نەكات بەراستی عیزەت بەتەواوی هەر هی خودایەو بێجگە لە خوا هەموی بێ دەسەڵاتەو لە ناوچوە ئەگەر چی بەرواڵەت چەند ڕۆژێك لە دنیادا خۆی بەشت بزانێ، كەئەو بیسەری هەمو قسەكانتانەو زانەری هەمو كردارەكانتانە.كەواتە گوێ بەقسە ناشیرینەكانی ئەوان مەدە.

﴿٦٦﴾ ئاگاداربن بێگومان موڵكی ﷲ یە ئەوەی كە لە ئاسمانان و زەوی دایە، خۆئەوان هاوبەشانێك ناپەرستن بێجگە لەﷲ، بەڵكو دوای گومان كەوتون خۆ ئەوان بێجگە لە گومان پەیڕەوی هیچیان نەكردوەو هیچ بەڵگەیەكی ڕاستیان بەدەستەوەنیەو بەندایەتیو پەیڕەوییان تەنها لەسەر بناغەی گومان و درۆیە، دەگونجێت (ما) بۆ پرسیار بێت، واتە ئەوە چین و چ نرخێكیان هەیە ئەوانەی كە بێجگە لەﷲ دەیانپەرستن؟! ئینجا ﷲ هەندێكی تر لە بەڵگەكانی دەسەڵاتو هێزو سۆزی خۆی باس

۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ نُوحٍ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ إِن كَانَ كَبُرَ عَلَيۡكُم مَّقَامِي وَتَذۡكِيرِي بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَعَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡتُ فَأَجۡمِعُوٓاْ أَمۡرَكُمۡ وَشُرَكَآءَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُنۡ أَمۡرُكُمۡ عَلَيۡكُمۡ غُمَّةٗ ثُمَّ ٱقۡضُوٓاْ إِلَيَّ وَلَا تُنظِرُونِ ﴿٧١﴾ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَمَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٧٢﴾ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِۦ رُسُلًا إِلَىٰ قَوۡمِهِمۡ فَجَآءُوهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَمَا كَانُواْ لِيُؤۡمِنُواْ بِمَا كَذَّبُواْ بِهِۦ مِن قَبۡلُۚ كَذَٰلِكَ نَطۡبَعُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٧٤﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَا مِنۢ بَعۡدِهِم مُّوسَىٰ وَهَٰرُونَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ بِـَٔايَٰتِنَا فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ مِنۡ عِندِنَا قَالُوٓاْ إِنَّ هَٰذَا لَسِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٧٦﴾ قَالَ مُوسَىٰٓ أَتَقُولُونَ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَكُمۡۖ أَسِحۡرٌ هَٰذَا وَلَا يُفۡلِحُ ٱلسَّٰحِرُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوٓاْ أَجِئۡتَنَا لِتَلۡفِتَنَا عَمَّا وَجَدۡنَا عَلَيۡهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلۡكِبۡرِيَآءُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا نَحۡنُ لَكُمَا بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٨﴾

دەكات بۆمان تابەڵكو بیر بكەینەوەو خۆمان لە نەزانیو گومڕاهی ڕزگاربكەینو دەفەرموێ:

﴿٦٧﴾ خوا ئەو زاتەیە كە شەوی دروستكردووە بۆتان تا بحەسێنەوەو ئارام بگرن تێیدا و ڕۆژیشی بۆ دروست كردون كە ڕوناكە تا ئیشی تێدا بكەن واتە خوا ئەو زاتەیە كەلە زۆربەی هەرەزۆری ئەم زەوییەدا لە هەر بیستو چوار كات ژمێردا بەشێكی تاریك ئەكات كە ئیسراحەتی تێدا بكەن و بەشێكی تری ڕوناك دەكات تا هەوڵو كۆششی بژێوی تێدا بدەن ئاشكرایە ئەم گۆڕان كارییە بێجگەلە خوا بەكەس ناكرێت دەی بەبێگومان ئالەمەدا چەندین بەڵگەی گەورە لەسەر دەسەڵاتو سۆزی خودا هەیە بۆگەلێك كە شت وەرگرێو ببیسێت، بەڵگەكان بۆ هەمو كەسن بەڵام ئەوكەسەی كە مەبەستێتیو چاك گوێی بۆ ئەگرێت تەنها ئەو سودی لێ وەر ئەگرێت بۆیە ئەفەرموێ: ﴿ لِّقَوۡمٍ يَسۡمَعُونَ ﴾ بۆ ئەوانەی كە دەبیستنو لە قسە تێدەگەن، دیسان با ئەداتەوە سەر قسەیەكی تری بێ باوەڕان كە

﴿٦٨﴾ وتیان: الله منداڵی هەیە، پاكو بێ عەیبە ئەو زاتەو دەوڵەمەندو بێ نیازە، هەرموڵكی ئەوزاتەیە ئەوەی كەلە ئاسمانانو زەوی دایە، دەی كە موڵكی بو ئیتر چۆن ئەبێت بە هاوسەری یان ئەولادی؟! هیچ بەڵگەیەكتان لا نیە لەم بارەوە، ئایا ئێوە درۆ بەدەمی خوداوە دەكەنو شتێك دەڵێن دژی اللهﷻ كە خۆتان نایزانن؟

﴿٦٩﴾ بڵێ بێگومان ئەوكەسانەی كە درۆ دەكەن بەدەمی خوداوە هەرگیز ڕزگار نابن.

﴿٧٠﴾ ئەو درۆیانەی كەدیكەن تەنها ڕابواردنی چەند ڕۆژێكی دنیایەو سەرگەرم كردنەو هیچی تر. لە پاشان دەگەڕێنەوە بۆ لای ئێمە، پاشان ئێمە پێیان دەچێژین سزایەكی زۆر بەهێز بە هۆی ئەوەی كە لە دنیادا بێ باوەڕ بوون بە ئێمەو بە نیشانەكانمان. ئێنجا خوای گەورە داستانی نوح پێغەمبەرمان ﷺ بەكورتی بۆ باس ئەكاتودەفەرموێ:

﴿٧١﴾ ئەی محمدﷺ بخوێنەرەوە بەسەریاندا دەنگوباسی نوح، بەڵكو پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرنو لە بێ باوەڕی واز بهێنن ئەو كاتەی كە وتی: بەگەلەكەی ئەی گەلی من: ئەگەر پلەو پایەی منو ئامۆژگاریەكانم بە نیشانەكانیﷻ لاتان گەورەیەو پێتان ناخۆشە كەیفی خۆتانەو من ئەوەم پێ سپێرراوە، ئەوسا هەر بەئەویش پشت دەبەستم دەی ئێوەش بڕیاری خۆتان وهاوبەشەكانتان دژی من بگرن، با لە بڕیارەكانتان دا سەبارەت بەمن هیچ پێچو پەنایەكی تێدا نەبێو ڕۆشن بێ لەپاش دا بڕیاری خۆتان دژی من بدەنو ماوەم پێ مەدەن، بێ منەت بن.

﴿٧٢﴾ خۆ ئەگەر ئێوە پشت هەڵ دەچەرخێننو باوەڕم پێ ناكەن زیان لە خۆتان دەدەن ئەگینا من لەسەر ئەم بانگەوازەم داوای هیچ شتێك لە ئێوە ناكەم تا بڵێن توانامان نیەو پاداشتی من نیە بێجگە لەلایﷻ خۆیو من فرمانم پێ كراوە كە یەكێك بم لە موسڵمانان.

﴿٧٣﴾ بەڵام گەلەكەی لەباتی باوەڕهێنان بەدرۆیان خستەوە جا ئێمە خۆیو ئەوانەیش كە لەگەڵیدا بوون لەكەشتیەكدا ڕزگارمان كردنو كردمانن بە جێنشینو ئەوانەی كە بێ باوەڕ بوون بە نیشانەكانمان لەدەریای نیل خنكانمان جاتۆش تەماشا بكە ئەی محمدﷺ وەئەی بینەر، ئەی ئەو كەسەی كە بەچاكی لە قورئان ورد دەبیتەوە تەماشا بكەو بزانە پاشە ڕۆژی ئەو كەسانەی كە ترسێنران چۆن بووەوچییان بەسەر هات.

﴿٧٤﴾ لەپاشان پاش نوح پێغەمبەرانی ترمان نارد بۆ سەر گەلەكانی خۆیان ئەوانیش بەبەڵگە ئاشكراكان هاتنە ناو گەلەكانیانو بەرەو خواپەرستی بانگیان كردن بەڵام ئەوانیش باوەڕیان نەهێنا بەوەی كە خەڵكانی پێش خۆیان باوەڕیان پێ

نەهێنا بوو، جا هەروەك ئەوان دڵی دەست درێژكاران مۆر دەكەین كە ئیتر حەق‌و راستی نابیسن. ئینجا خوای گەورە ئەفەرموێ:

(٧٥) لە پاش ئەوان موساو هارونمان بە نیشانەكانی خۆمانەوە نارد بۆ لای فیرعەون پیاو ماقوڵانی، لەباتی باوەڕهێنان خۆیان بەگەورە زانی‌و باوەڕیان نەهێناو ئەوان گەلێكی تاوانباربون.

(٧٦) خۆ ئەو كاتەی كە حەق‌و راستی لەلایەن ئێمەوە هاتەلایان وتیان: بێگومان ئەمە سیحرێكی ئاشكرایەو موسا ئەیەوێ بەم سیحرو جادوە ئێمە لەسەر رێبازی راستەقینەی خۆمان لابدات‌و خراپە بڵاو بكاتەوە بەسەر زەویدا.

(٧٧) موسا ﷺ وتی: ئێوە بەو راستیەی كە هاتوەتە لاتان ئەڵێن ئەمە سیحرە؟ ئەگەر وابێ، دڵنیا بن كە جادوگەران هەرگیز رزگارنابن، واتە: ئەگەر ئێمە جادوگەربین هەرگیز سەركەوتن بەدەست ناهێنین. بەڵێ بێ باوەڕان لەسەر قسەیەك ناوەستن بەڵكو وەك بولبول بۆخۆ دزینەوە لەحەق هەر لەحزەیەك بەرەولایەك دەفڕن‌و لەملاولا قسە دێنن.

(٧٨) وتیان: ئایا ئێوە هاتوونەتە لای ئێمە تا ئێمە لادەن‌و دوورمان بخەنەوە لەوەی كە باوو باپیرانمانی لەسەر بووە، وە تا ئێوە لەم زەوییەدا ببن بە گەورەو خاوەن دەسەڵات؟! واتە: بۆ ریاسەت وا دەڵێن‌و دەتانەوێ فرمان رەوای ئێمە بن لەم سەر زەویەدا ئەوسا ئێمە هەرگیز باوەڕتان پێ ناكەین

(٧٩) فیرعەون وتی: هەمو جادوگەرانی زانام بۆ بهێنن تا بەرەنگاری ئەم جادوگەرە بوستنەوە.

(٨٠) جا كاتێك جادوگەرەكان هاتن‌و لەلای فیرعەون كۆبونەوەو موسایش لە كاتی دیاری كراودا هات‌و ئامۆژگاری كردن‌و وتی: لە خوا بترسن ئەوەی كە ئێوە دەیكەن جادوگەرییەو جادو گەرانیش هەرگیز سەرناكەون، بەڵێ بەراستی ئەم ئامۆژگارییە كاری خۆی كرد وەك لە سورەتی (طه)دا دێت وئەوان وتیان ئەی موسا: یان تۆ ئیشی خۆت بكە یان ئێمە، موسا وتی: ئێوە فڕەی بدەن ئەوەی كە فڕەی دەدەن، واتە: چی دەتوانن بكەن بیكەن بێ منەت بن.

(٨١) جا كاتێك كە ئەوان فرت‌و فێڵ‌و جادوی خۆیان كرد، موسا وتی: ئەوەی كە ئێوە كردوتانە جادوە، بێگومان كەاللە هەڵیدەوەشێنێتەوەو لەناوی دەبات، بێگومان كەاللە كرداری خراپەكاران چاك ناكات‌و نایەڵێت جێگا بگرێت‌و بگات بەمەبەستی خراپی خۆی.

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ٱئۡتُونِي بِكُلِّ سَٰحِرٍ عَلِيمٖ ﴿٧٩﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلۡقُواْ مَآ أَنتُم مُّلۡقُونَ ﴿٨٠﴾ فَلَمَّآ أَلۡقَوۡاْ قَالَ مُوسَىٰ مَا جِئۡتُم بِهِ ٱلسِّحۡرُۖ إِنَّ ٱللَّهَ سَيُبۡطِلُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُصۡلِحُ عَمَلَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٨١﴾ وَيُحِقُّ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٨٢﴾ فَمَآ ءَامَنَ لِمُوسَىٰٓ إِلَّا ذُرِّيَّةٞ مِّن قَوۡمِهِۦ عَلَىٰ خَوۡفٖ مِّن فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِمۡ أَن يَفۡتِنَهُمۡۚ وَإِنَّ فِرۡعَوۡنَ لَعَالٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ﴿٨٣﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ يَٰقَوۡمِ إِن كُنتُمۡ ءَامَنتُم بِٱللَّهِ فَعَلَيۡهِ تَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّسۡلِمِينَ ﴿٨٤﴾ فَقَالُواْ عَلَى ٱللَّهِ تَوَكَّلۡنَا رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحۡمَتِكَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰ وَأَخِيهِ أَن تَبَوَّءَا لِقَوۡمِكُمَا بِمِصۡرَ بُيُوتٗا وَٱجۡعَلُواْ بُيُوتَكُمۡ قِبۡلَةٗ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيۡتَ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةٗ وَأَمۡوَٰلٗا فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِكَۖ رَبَّنَا ٱطۡمِسۡ عَلَىٰٓ أَمۡوَٰلِهِمۡ وَٱشۡدُدۡ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَلَا يُؤۡمِنُواْ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَلِيمَ ﴿٨٨﴾

(٨٢) ئەوسا اللە كلیمەكان‌و بڕیارەكانی خۆی كە سەركەوتن‌و رزگار كردنی چاكەكاران‌و لە ناوبردنی خراپەكارانە دێنێتە دی، هەرچەند تاوانبارانیش پێیان ناخۆش بێت. بەڵێ جادو گەران جادوی خۆیان كردو بە بڕیاری خوا موسا عەسای خۆی فڕەداو هەمو شتەكانی ئەوانی قوت داو پاشان عەساكەی هەڵگرتەوە كە هەر عەساكەی جارانبو.

(٨٣) ئەگەر چی ئەم راستیەو چەندین راستی‌و نیشانەی گرنگتر لە موسا بینران كە چی باوەڕیان نەهێنا بە موسا بێجگە لە كۆمەڵێكی كەم لە گەلەكەی لەترسی فیرعەون‌و لە ترسی پیاو ماقوڵانی گەلەكەی كە نەك توشی بەڵاو سزایان بكەن، وەبێگومان كە فیرعەون زۆر پایەبەرزو بەدەسەڵات بو لەسەر زەویداو خەڵك زۆر لێی دەترسان، خۆ بێگومان ئەو یەكێك بو لەوانەی كە زیادەڕەو بون‌و لە سنور دەرچوو بون لەسەرپێچی كردنی فەرمانیاللە داو بە هەمو شێوەیەك ئازاری خەڵكی دەدا، لە چوار مێخە كێشانی خەڵك‌و سك دڕینی ئافرەتان‌و كوشتنی منداڵانەوە تا دژایەتی خواو پێغەمبەران، ئینجا موسا دەستی كرد بەئامۆژگاری ئەو كۆمەڵە كەمەی كە باوەڕیان پێ هێنا بو.

(٨٤) وتی: ئەی گەلەكەم ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە اللە هەیە جا تەنها پشت بەو ببەستن ئەگەر ئێوە موسڵمان‌و تەسلیمی فەرمانی پەروەردگارن؟

قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ۞ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَقَدْ بَوَّأْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مُبَوَّأَ صِدْقٍ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ فَمَا ٱخْتَلَفُوا۟ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلْعِلْمُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِى بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿٩٣﴾ فَإِن كُنتَ فِى شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ حَقَّتْ عَلَيْهِمْ كَلِمَتُ رَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَوْ جَآءَتْهُمْ كُلُّ ءَايَةٍ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٩٧﴾

**(٨٥) جا ئەوانیش وتیان: تەنها پشت بەالله دەبەستین‌و وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئێمە نەکەی بەهۆی تاقی کردنەوەی گەلی ستەمکاران.**

**(٨٦) وەئەی پەروەردگارمان بەهۆی سۆزو بەزەیی خۆتەوە رزگارمان بکە لە گەلی بێ باوەڕان. بەڵێ: موسڵمان چەندە راست‌و دروست تربێت زیاتر پێویستی بەنزاو پاڕانەوە هەیە چونکە هەموشت بەدەستالله یەو ئەبێ لەگەڵ تەلاش‌و زەحمەتی خۆت دا چاوت تەنها لەو بێ‌و داوای یارمەتی تەنها لەو بکەیت، ئینجا الله دەفەرموێ:**

**(٨٧) جا ئێمە نیگاو وەحیمان کردە لای موساو براکەی کەبە گەلەکەت بڵێ: با لەو شارەدا یان لە میسردا خانو دروست بکەن، وە چونکە زۆر ئازار ئەدرێن با ماڵەکانتان بکەن بە قیبلەو لەماڵکانتان دا نوێژ بکەن تا زۆر نەکەونە بەرچاوی ستەمکاران‌و ئازارتان بدەن. لێرەدا بە چەند شێوەی تر باسکراوە بەڵام من ئەم شێوەم نوسی والله اعلم. ئینجا فەرموی: نوێژەکانتان بکەن وە موژدە بدەن بە باوەڕداران بە سەرکەوتن‌و بە بەهەشتی هەتا هەتایی.**

**(٨٨) موسا وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان تۆ بە فیرعەون‌و پیاو ماقوڵانی لە دنیادا شتی جوان‌و سامانی زۆرت پێداون، جا بەو هۆیەوە لە خۆ باییبون‌و دژایەتی ئێمە دەکەن، ئەی پەروەردگارم: بەو هۆیەوە خەڵك لەڕێبازەکەی تۆ لادەدەن، ئەی پەروەدگارم: ماڵەکانیان لە ناو ببە تا ئەوەند لوت بەرز نەبن‌و خەڵکیان پێ نەخەڵەتێ، وە دڵیان ببەستە چونکە شایستەی ئەوە نین کە میهرەبانی‌و سۆزیان لەگەڵدا بکەیت. دیارە ئەم نزایەی وەختێ کردوە کە خوا تێی گەیاندوە کە تازە باوەڕناهێنن وەکو لە پاشدا ئەفەرموێ: چونکە ئەمانە باوەڕ ناهێنن هەتا سزای دەردناك بەچاوی خۆیان نەبینن.**

**(٨٩) ئەفەرموێ فەرموی: دوعاکەتان وەڵام درایەوەو وەرگیرا، دەی ئێوەش راوەستن‌و خۆبگرن‌و بەردەوام بن لەسەر ئیشی خۆتان‌و نا ئومێد نەبن‌و گوێ شل مەکەن لە تانەو تەشەری نەزان‌و نەفامەکان‌و پەیڕەوی نەکەن لەرێچکەی ئەو کەسانەی کە هیچ شتێ نازانن لەبارەی ئایین‌و خوا ناسیەوە ئەگەر چی بۆ ژیانی دنیا زۆر زاناو پیتۆڵن، ئینجا الله ئەفەرموێ:**

**(٩٠) نەوەی یەعقوبمان لەو دەریایە رزگارکرد. ئەوەبو الله دەریای نیلی لەت کردو ئەو ئاوەتەڕەی وەکو دیواری شوشە وەستانی‌و ئەو قوڕەی ژێر ئاوەکەی زۆربەخێرای وشك کردەوەو ئەوان پەڕینەوەو فیرعەون‌و لەشکرەکەی گەیشتنە لێواری دەریا جافیرعەون کە دی دەریا لەت بوە لە باتی باوەڕهێنان‌و پەشیمان بونەوە وتی: ئەوتە ئاوەکەم لەت کردوە ئەگەر خودا نەبم چۆن شتی وادەکەم، بەڵێ تاوانباران‌و ملهوڕان تا بە تەواوی نەکەونە داوەوە دان بەهەڵەی خۆیاندا نانێن جا فیرعەون خۆی‌و سەربازەکانی بەشێوەیەکی ستەمکارانەو دوژمنانە بە شوێن ئەواندا چوون تا بەموساو گەلەکەی بگەن‌و لەناویان ببەن بێ ئاگا لەوەی کەئەمە تەڵەیەو دەکەونە ناویەوەو تازە لێی رزگارنابن، بەڵێ چون هەتا زۆریان نەما بۆ دەرچون‌و هیچ کەسیان لە وشکاییدا نەمانەوە، ئینجاالله فەرمانی بە دەریاکرد کەوەك خۆی‌و جاران یەك بگرێتەوە، ئینجا فیرعەون زانی کەئەمە داوی ئەو بوەو تۆڵەی موساو قەومەکەیەتی‌ودەریا دایدەپۆشێت بۆیە لە وێدا پەشیمان بویەوەو وتی: باوەڕم هێناوە بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی راستەقینەی تر نیە بێجگە لەو زاتەی کە نەوەی یەعقوب باوەڕیان پێ هێناوەو منیش لە موسڵمانانم. لێرەدا دوو شتی وت: یەکەم ئیمانم هێناوە. دووهەم: وەمن لە موسڵمانانم. بەڵام الله ئەفەرموێ:**

**(٩١) ئائێستە باوەڕ دەهێنی کە دەزانی تازە رزگار نا بی؟ وە بەراستی تۆ لە پێش ئێستادا سەرپێچی‌و تاوانت کردوە، وە تۆ لە ریزی خراپەکارانی، واتە: خوا باوەڕەکەی لێ وەرنەگرت چونکە گەیشتبوە حاڵێك تازە رزگاربونی نەبو وەك ئەو کەسانەیە کە گیان ئەگاتە قوڕگیان کە ئەوانیش لەو کاتەدا باوەڕیان لێ**

وەرناگیرێت وەکو لە سورەتی (النِّسَاء) دا باسکرا. بەڵێ سەرئەنجام فیرعەون‌و پەیڕەوانی لەو دەریایەدا کە خۆی پێ هەڵدەکێشا خنکاو موساو پەیڕەوانی رزگاریان بو بەڵام دەسەڵات‌و هێزی فیرعەون ئەوەندە کاری کردبوە سەر بیرو بۆچونی ئەو خەڵکە هەندێك باوەڕیان نەدەکرد کە فیرعەن خنکابێ بۆیە ﷲ فەرموی:

(٩٢) ئەمڕۆ لاشەکەی تۆ دەرئەخەین تا خەڵك بەچاوی خۆی بیبینێ‌و دڵنیاببن کە تۆ خنکاوی‌و بزانن کە هیچ کەس ناتوانێ دژایەتی‌ﷲ بکات‌و دوژمنان لە دەستی دەرناچن هەرچی بکەن سەرئەنجام وەك فیرعەون‌و دارو دەستەکەی ئەکەونە داوەوەو بەرەو جیهانی هەتا هەتایی‌و لێکۆڵینەوە دەگەڕێنەوە، بەڵێ ﷲ لاشەکەی فیرعەونی خستە جێگایەکی بەرزەوە تا هەمو ببینن‌و تا بۆ ئەوانەی کەلە دوای ئەو دێن ببێتە نیشانەیەك لە سەرهێزو دەسەڵاتی‌ﷲ و بزانن کە دژایەتی خوداو ئایین‌و پێغەمبەران (علیهم السلام) سەرئەنجامی ئاوایە. بەداخەوە مرۆڤ زۆر چاوی قەوییەو زوو شتی لەبیر دەچێتەوەو لەو روداوە گرنگانە پەندو ئامۆژگاری وەرناگرێت؟! وەك ﷲ دەفەرموێ: ئەوسا زۆربەی خەڵك لە نیشانەکانی ئێمە بێ ئاگان‌و سودی لێ وەرناگرن!

(٩٣) بەراستی ئێمە نەوەی یەعقوبمان لە شوێنێکی باشدا دانا کە هەرچی پێویست بو تێیدا هەبو کە بریتی بو لە میسرو شام‌و لە هەمو شتێکی پاك رۆزی ئەوانمان دا، جا ئەم جولەکانە باوەڕیان بەهاتنی پێغەمبەرمان‌ﷺ هەبو زۆریش چاوەڕوانی هاتنیان دەکرد بەڵام کاتێ هات‌و لە خۆیان نەبو هەرچەند کەدەیانزانی راستە کەوتنە دژایەتی وەك ﷲ دەفەرموێ: ئەوسا ئەوان ناڕێك نەبون لە هاتنی پێغەمبەردا تائەوکاتەی کە هاتەلایان بەڵام کاتێ کەهاتەلایان کەوتنە دژایەتی‌و بەدرۆ خستنەوەی جا خوا هەڕەشەیان لێ ئەکات‌و دەفەرموێ: بێگومان پەروەردگارت لە رۆژی قیامەتدا لەبارەی ئەوشتەی کە ئەوان لەدنیادا ناڕێکن تێیداو دانی پێدا نانێن لە نێوانیاندا بڕیار دەدات، باوەڕداران رزگار دەبن‌وبێ باوەڕانیش سزادەدرێن.

(٩٤) ئەی محمد ﷺ ئەگەر تۆ لە گوماندای سەبارەت بەوەی کە بۆمان ناردویت تۆ پرسیار بکە لەو کەسانەی کەوا پەڕاو دەخوێننەوە، واتە: تەورات‌و ئینجیل چونکە ئەوان بە چاکی تۆ دەناسن‌و دەزانن کە تۆ راستیت.

جا لێرەدا مەبەست ئەوکەسەیە کە گومانی لەم قورئانەدا هەبێ، جا دەفەرموێ: بەراستی لەلایەن پەروەردگارتەوە حەقیقەت‌و راستیت هاتە لا کە ئەم قورئانەیە، ئەوسا تۆ لەو کەسانە نەبی کەوا لە گومان دان سەبارەت بەم قورئانە.

(٩٥) جا تۆ لەو کەسانە مەبە کە بێ باوەڕبون بە نیشانەکانی ﷲ چونکە ئەگەر وابی بێگومان تۆ لە ریزی رەنجەڕۆو زیان لێ کەوتواندا دەبیت. ئەبێ ئەوەش بزانین کە کەسێ بڕیاری خوا دەرچوبێ بۆ بێباوەڕی و کافربونی ئەوە هەروائەبێ‌و کەس ناتوانێ دەستکاری بکات‌و ئاشکرایشە خوا زانیاری تەواوی هەیە بەسەردروستکراوەکانیدا پێش ئەوەی دروستیان بکات‌و لە سەر ئەو زانیاریەی بڕیاری خۆی نوسیوەو ئەفەرموێ:

(٩٦) بەبێگومان ئەوانەی کە بڕیاری خوای تۆ بۆ لاساری‌و لارێیان دەرچوە تازە ئەوانە باوەڕناهێنن، واتە: تۆ گەیاندنی پەیامی خۆتت لە سەرەو لەسەر بێ باوەڕی ئەوان تۆ غەمگین‌و پەست مەبە.

جا ﷲ سەبارەت بەم جۆرە کەسانە بڕیاری خۆی روون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٩٧) ئەگەر تۆ هەمو بەڵگەیەك بهێنی بۆیان تازە ئەم جۆرە کەسانە باوەڕ ناهێنن تا سزای دەردناك نەبینن، ئاشکرایە کەئەو کاتەش باوەڕهێنانیان بێ سودە. جا ﷲ دەفەرموێ:

(٩٨) هیچ وڵاتێك نەبوە کە سزای بۆ هاتبێ‌و لەو کاتەدا باوەڕیان هێنا بێت‌و سزاکەیان لەسەر لابرا بێت بێجگە لە گەلی یونس، بەڵام ئەم گەلە لەکاتێکدا کە سزایان بۆ هات پێش ئەوەی تێدا بچن لە ئیشی خۆیان پەشیمان بونەوەو گەڕان بەشوێن پێغەمبەرەکەیاندا، چونکە لەپێشدا لە ناویاندا دەرچو بو پەیدایان نەکرد بەڵام ئەمان بڕیاری راستەقینەیان داو باوەڕیان هێنا، جا لەوکاتەی کەباوەڕیان هێنا ئێمەیش ئەو سزایەمان لەسەر ئەوان لابرد کە سزایەکی سەرشۆڕکەربو لە دنیادا، وەئەوانمان ژیاند تاکاتی دیاری کراوی خۆیان، ئەم باسە بەدرێژتر لە سورەتی (الأَنبِيَاءُ) و(الصَّافَّات)دا دێت.

(٩٩) ئەی محمد ﷺ ئەگەر پەروەردگارت ئارەزۆی لێ بێ ئەوەی لەسەر زەویدایە هەموی باوەڕئەهێنێ. بەڵام دنیا بۆ تاقی کردنەوەیەو تۆ راگەیاندن‌و تێگەیاندنی خەڵکت پێ سپێرراوە. ئەم سورەتە مەکیەو هێشتا جیهاد واجب نەبوە. ئایا تۆ زۆر لە خەڵك دەکەیت هەتا ببن بەباوەڕدار؟ نابی وابیت تۆ تەنها ئەوەت لەسەرە کە بەدڵێکی سافو بێ گەردەوە بانگەوازی ئیسلام بەهەموکەس راگەیەنیت، جا خەڵکیش با بۆ خۆی بڕیاری خۆی بدات، جا بەم مانایە موحکەمە. بەراستی دەبێ ئەوە بزانین کەهیچ کەس لەتوانایدا نیە کە کەس هیدایەت بدات بێجگە لە ﷲو بانگەوازخوازانی ئایین دەبێ مرۆڤی زۆر هێواش‌و دڵسۆزو روخۆشبن لەگەڵ بانگ کراواندا بەڵکو باوەڕ بهێنن، خۆ نابێ

فَلَوْلَا كَانَتْ قَرْيَةٌ ءَامَنَتْ فَنَفَعَهَآ إِيمَٰنُهَآ إِلَّا قَوْمَ يُونُسَ لَمَّآ ءَامَنُواْ كَشَفْنَا عَنْهُمْ عَذَابَ ٱلْخِزْىِ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿٩٨﴾ وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَءَامَنَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا ۚ أَفَأَنتَ تُكْرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تُؤْمِنَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾ قُلِ ٱنظُرُواْ مَاذَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْءَايَٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾ فَهَلْ يَنتَظِرُونَ إِلَّا مِثْلَ أَيَّامِ ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلِهِمْ ۚ قُلْ فَٱنتَظِرُوٓاْ إِنِّى مَعَكُم مِّنَ ٱلْمُنتَظِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ثُمَّ نُنَجِّى رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ۚ كَذَٰلِكَ حَقًّا عَلَيْنَا نُنجِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمْ فِى شَكٍّ مِّن دِينِى فَلَآ أَعْبُدُ ٱلَّذِينَ تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَٰكِنْ أَعْبُدُ ٱللَّهَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُمْ ۖ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠٤﴾ وَأَنْ أَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٥﴾ وَلَا تَدْعُ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكَ وَلَا يَضُرُّكَ ۖ فَإِن فَعَلْتَ فَإِنَّكَ إِذًا مِّنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٦﴾

لەبەر بێ باوەڕیان ڕقیان لێ هەڵگرێت چونکە ئەگەر ڕق لە بێ باوەڕ هەڵگرێتوقسەی لە گەڵدا نەکات ئەی کێ بانگ ئەکات بۆ ڕێبازیﷲ؟ ئەبێ تەنها ڕقی لە کوفرو بێ دینیو بێ ڕەوشتی ببێتو هەوڵدات مەردم لەوانە ڕزگاربکاتو لە کۆمەڵگای شەیتانەوە بەرەو کۆمەڵگای خواناسان بیان هێنێو لە خوایش بپاڕێتەوە کە ڕێنماییان بکات .

(١٠٠) چونکە هیچ کەسێك ناتوانێ باوەڕ بهێنێ مەگەر خوا خۆی ماوەی پێ بدات، ئەمەش بەهۆی لاساریو دڵ پیسی ئەو کەسە خۆیەتی بۆیە خوا ڕێنمایی ناکاتو کوفرو ڕەوشت پیسی لەسەر ئەو کەسانە دادەنێت کە ژیری خۆیان ناخەنە کارەوە تا ڕاستیو ناڕاستی لەیەك جیا بکەنەوەو پەیڕەوی ڕاستی بکەن، جا کەسێ کە خوا ژیری پێداو پێغەمبەرو پەراوی بۆ نارد بەڵام ئەو هەرخۆی گێل کرد ئایا شایستەی ئەوەنیە کەلە هەموو نازو نیعمەتێکیﷲ بێوەری بکرێت؟ لەگەڵ ئەوەشدا خوا لە دنیادا تەمەنی چاکو ماڵو سەروەتی زۆریشیان پێ ئەداتو زۆربەی هەرە زۆری سزاکەیان دوادەخرێت بۆ قیامەت کە هەرگیز ناخرێنە بەهەشتەوە، چونکە هیچ مرۆڤێکی بێ باوەڕ ناچێتە بەهەشتەوە،

وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:{ **لَا تَدْخُلُونَ الجَنةَ حَتى تُؤْمِنُوا وَلَا تُؤْمِنُوا حَتى تَحَابوا**/ مسلم وغ ە/ ناچنە بەهەشتەوە هەتا باوەڕ نەهێننوباوەڕداریش نابن هەتا یەکترتان خۆش نەوێ}

(١٠١) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: تەماشا بکەنو بزانن ئەوەی کە لە ئاسمانو زەویدا هەیە لە ئەستێرەو مانگو ڕۆژو دەریاو چیاو جۆرەها میوەو گوڵو گیاو هاتوچۆی مرۆڤ بەو کەشتیە گەورانە لە ناو دەریاکانداو هەزاران جۆر گیانلەبەرو باڵندە کە هەریەکەی تامو لەزەتێکی تایبەت بە ژیانی مرۆڤ دەدات، بەڵام نە ئایەتەکانمان وە نە ترسێنەرەکانمان هیچیان سود ناگەیەنن بەگەلێك کەنایانەوێ باوەڕ بهێنن؟!

(١٠٢) ئایا بێجگە لە وێنەی ئەو سزاو ڕۆژگارە ڕەشەی کەسانی پێش خۆیان نەبێ چیتر چاوەڕێ دەکەن؟ واتە: با دڵنیا بن مادام باوەڕ بە تۆ نەهێنن بێجگە لەو وەزعە خراپەی گەلانی پێش خۆیان شتێکی تر بۆ ئەمانیش نیە، پێیان بڵێ: جا با چاوەڕوان بن بێگومان منیش هەر لەگەڵ ئێوەدا لەوانەم کە چاوەڕوانی دەکەن، بەڵێ ئەوان سزادران .

(١٠٣) لەپاشان ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانو ئەو کەسانەیش باوەڕیان هێنا بو ڕزگارمان کردن، هەر ئاوەها پێویستمان کردوە لە سەر خۆمان کە باوەڕداران ڕزگار بکەین، جا باوەڕداران باتەنها لەبیری بەهێزکردنی باوەڕەکانی خۆیاندابنولە خوا بترسن کە سەرئەنجام هەرئەوانن خۆش بەختو ڕزگار جا با بەکەمێ گێرەو کێشەی دنیا نائومێدو دەستە پاچە نەبن، ئەمە بڕیاریﷲ یە.

(١٠٤) ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەی خەڵکینە ئەگەر ئێوە گومانتان هەیە لەم ئاینەو لەم قورئانەی کە بۆ من هاتوە دەی باچاك بزاننو دڵنیابن کە من هەرگیز بەندایەتی ناکەم بۆ ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن بێجگەلە ﷲ بەڵام من بەندایەتی ئەو خودایە دەکەم کە ئێوە دەمرێنێتو من دەستورم پێ دراوە کەلە باوەڕداران بم ئەوە ئیشی منو ڕێبازی منە.

(١٠٥) تۆ ڕوی خۆت بکەرە ئەو ئاینەی کە ڕەوانەم کردوە بۆتو لە هەموو لاریو نارێکییەك خۆت دوور بگرەو تۆ لە ناو بت پەرستانو موشریکاندا نەبی.

(١٠٦) ئەوسا بێجگە لە ﷲ هاوار نەکەیتە ئەوەی کە نە سودت پێ دەگەیەنێتو نە دەتوانێ زیانت لێ بدات جا ئەی محمدﷺ ئەگەر تۆ ئاوەهات کرد بەڕاستی تۆ لە ڕیزی ستەمکاران حیساب دەکرێیت. ئەمە بۆ پێغەمبەرﷺ ئاوەهایە ئەی بۆ ئێمە دەبێت چۆن بێ؟

(١٠٧) جا ئەگەرﷲ دوچاری زیانێکت بکات هیچ کەس ناتوانێت ئەو زیانەت لەسەر لابات مەگەر خۆی، وەئەگەر خوا ئیرادەی خێرت بۆ بکات هیچ بەرپەرچێك نیە بۆ ئەو خێرو بەرەکەتەی

ئەو، چونکە هەر خوا خۆی چاکەو خێری بێ سنوری هەیە کە دەیبەخشێت بەو کەسەی ئارەزۆی لێ بێ لە بەندەکانی، وەهەر خوایە کە زۆر لێخۆش بوو زۆر بەسۆزە سەبارەت بەبەندەکانی. دەبا بەندەکانیشی بە وەفا بن‌و بەندایەتی راست‌و دروستی ئەو خودایە بکەن، ئینجا خوای زاناو کاربەجێ کۆتایی سورەتەکە ئەبەستێتەوە بە سەرەتاکەیەوە کەباسی قورئانی کرد وەودەفەرموێ:

(١٠٨) ئەی خەڵکینە بەراستی قورئانێکی راست‌و رەوان لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتوەتە لاتان‌و رێنماییتان دەکات بۆ هەمو ئیشێکی چاك، جا ئەو کەسەی کە رێگای هیدایەت بگرێت سودەکەی هەربۆ خۆیەتی‌و هەرکەسێکیش گومرا بێت ئەوا زیانی گومراییەکەی هەر لەسەر خۆیەتی‌و من چاودێرو پاسەوان نیم بەسەر ئێوەوە کە نەیەڵم بەم لاولادا برۆن، من تەنها گەیاندنم لەسەرە.

(١٠٩) ئەی محمد ﷺ تۆ پەیرەوی ئەوە بە کە وەحی ئەکرێتە لات‌وخۆت بگرە لەسەر ئێش‌و ئازاری دوژمنان هەتا ﷲ بریاری خۆی سەبارەت بەوان دەدات‌و ئەو چاکترینی هەمو حاکم‌و بریاردەرانە چونکە ئەو بێجگە لە راستی‌و داد هیچ برپارێکی تر نادات.

## سورەتی هود ١١ ١٢٣

سورەتی هود کە سورەتی یانزەهەمی قورئانە، لە مەکەدا دابەزیوەو سەدوبیست‌وسێ ئایەتە ، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاوسێهەمەو پاش سورەتی (**یونس**)و پێش (**یوسف**) دابەزیوە. لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ /الترمذي، صححه الالبا / هودو واقیعەو مورسەلات‌و عەممە یەتەسائەلون وە کویرەت پیریان کردم} ناوی پێغەمبەر هود ؑ یەك جار لە سورەتی شوعەراو یەکجار لە سورەتی ئەعراف‌و پێنج جار لەم سورەدا هاتوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف، لام، را، ئەم قورئانە پەراوێکە مەحکەم کراوە ئایەتەکانی‌و رێك وپێکن‌وبە شێوەیەکی چاك‌و رەوان بێژراوو دارێژراون، پاشان درێژەی پێدراوەو رۆشن کراوەتەوە لەلایەن کەسێکەوە کە کار بە جێ‌و زۆر بەئاگاو لێ زانە. بەڵێ ئەم پەراوە رێك‌و پێك بێژراوە چونکە (حکیم) داینا‌وەو ئایەتەکانی درێژەی پێدراوەو رۆشن کراوەتەو ،چونکە (خبیر)ەو بەئاگایە بەسەر

وَإِن يَمْسَسْكَ اللَّهُ بِضُرٍّ فَلَا كَاشِفَ لَهُ إِلَّا هُوَ وَإِن يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلَا رَادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَهُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ (١٠٧) قُلْ يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءَكُمُ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا وَمَا أَنَا عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ (١٠٨) وَاتَّبِعْ مَا يُوحَىٰ إِلَيْكَ وَاصْبِرْ حَتَّىٰ يَحْكُمَ اللَّهُ وَهُوَ خَيْرُ الْحَاكِمِينَ (١٠٩)

## سُورَةُ هُودٍ ١١ ١٢٣

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الر كِتَابٌ أُحْكِمَتْ آيَاتُهُ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ (١) أَلَّا تَعْبُدُوا إِلَّا اللَّهَ إِنَّنِي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ وَبَشِيرٌ (٢) وَأَنِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَاعًا حَسَنًا إِلَىٰ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِي فَضْلٍ فَضْلَهُ وَإِن تَوَلَّوْا فَإِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ (٣) إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٤) أَلَا إِنَّهُمْ يَثْنُونَ صُدُورَهُمْ لِيَسْتَخْفُوا مِنْهُ أَلَا حِينَ يَسْتَغْشُونَ ثِيَابَهُمْ يَعْلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعْلِنُونَ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٥)

هەمو شتێکدا هەر لەبەر ئەوەیشە رەخنەگیر لەم قورئانە کافر دەبێت چونکە دژایەتی کردنی دانایی‌وزانایی‌و ئاگایی خودایە.

(٢) خۆ ئەم قورئانە بۆیە رەوانەکراوە تا هیچ کەس نەپەرستن بێجگە لەخودا. وە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: بەراستی من بۆ ئێوە ترسێنەرو موژدەدەرم، بەڵێ ئەم پەراوە هاتوە بۆ ئەوەی کە بێجگە لە خوا بەندایەتی بۆ کەسی تر نەکرێت تەنها ئەو بە پەروەردگار بزانرێت، وە پێویستە بۆ چاوپۆشی لەتاوان تەنها داوا لەو بکرێت وەکو دەفەرموێ

(٣) جا داوای لێ خۆشبون لە پەروەردگاری خۆتان بکەن بۆ ئەو تاوانانەی کە لە پێشدا کردوتانەو هەمیشەیش هەر رووتان لە خوا بێت‌و بگەرێنەوە بۆلای ئەو کە ئەتان ژیێنێت بەژیانێکی جوان‌و شیرین تا کاتی ناوبراو کە مردنە، چونکە هەر کەسێك ماوەیەکی دیاری کراوی خۆی هەیەو لەو ماوەدا کەم‌و زیادی بۆ ناکرێت، ئەوساﷲ بەهەر کەسێك کە خاوەنی چاکەو بەندایەتیە خەیرو بەرەکەتی خۆی بەسەردا ئەرژێنێ‌و پاداشتی ئەداتەوەو ئەگەر روویش لەم ئاینە وەرچەرخێنن‌و پشتی تێ بکەن، خوا بێ نیازە لێتان بەڵکو ئەوسا من ترسم هەیە لێتان کە سزای رۆژی گەورە کە قیامەتە دوچارتان ببێت. پێویستە کە بزانن ژیانی باش تەنها سەروەت‌و سامان نیە بەڵکو ژیانی باش‌وخۆش دڵخۆشیە بەئاینە جا هەرکەسێك لە بیری پاشە رۆژی خۆیدا بوو

۞ وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي ٱلْأَرْضِ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِ رِزْقُهَا وَيَعْلَمُ مُسْتَقَرَّهَا وَمُسْتَوْدَعَهَا ۚ كُلٌّ فِي كِتَٰبٍ مُّبِينٍ ﴿٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُۥ عَلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۗ وَلَئِن قُلْتَ إِنَّكُم مَّبْعُوثُونَ مِنۢ بَعْدِ ٱلْمَوْتِ لَيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ وَلَئِنْ أَخَّرْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِلَىٰٓ أُمَّةٍ مَّعْدُودَةٍ لَّيَقُولُنَّ مَا يَحْبِسُهُۥٓ ۗ أَلَا يَوْمَ يَأْتِيهِمْ لَيْسَ مَصْرُوفًا عَنْهُمْ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٨﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِنَّا رَحْمَةً ثُمَّ نَزَعْنَٰهَا مِنْهُ إِنَّهُۥ لَيَـُٔوسٌ كَفُورٌ ﴿٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ نَعْمَآءَ بَعْدَ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ ذَهَبَ ٱلسَّيِّـَٔاتُ عَنِّيٓ ۚ إِنَّهُۥ لَفَرِحٌ فَخُورٌ ﴿١٠﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ كَبِيرٌ ﴿١١﴾ فَلَعَلَّكَ تَارِكٌۢ بَعْضَ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيْكَ وَضَآئِقٌۢ بِهِۦ صَدْرُكَ أَن يَقُولُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ كَنزٌ أَوْ جَآءَ مَعَهُۥ مَلَكٌ ۚ إِنَّمَآ أَنتَ نَذِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿١٢﴾

ئیشی باشی بۆ کرد دڵخۆشه به هاتنی دوا رۆژو پاداشتی ﷲ بەڵام ئەوکەسەی کە ئاگای لە پاشە رۆژنەبێ با هەمو ژیانی پڕلەنازو نیعمەت بێ شتێکی کەمەو هیچ روناکیەك لە ناودڵیدا نیەو هەمیشە لە مەرگو لە ناو چون ئەترسێو هەموخۆشیو شادییەکەی دنیای لاتاڵ ئەبێ،

﴿٤﴾ گەڕانەوەی ئێوە هەر بۆ لای خودایەو لەوێ تۆڵەو پاداشی کارەکانتان وەرئەگرنو ئەو دەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو هیچی لێ پەنانادرێتو هیچی لێ ناشاردرێتەوە،

﴿٥﴾ ئاگاداربن کەئەوان رقو قینی خۆیان لەئایینو پێغەمبەر لە ناو دڵی خۆیاندا دەشارنەوەو بەرواڵەت خۆیان چاك پیشان دەدەن، دەیانەوێ بەم کارەیان خۆیان لە خودا بشارنەوە، تەنانەت هەندێ جار بۆ خۆشاردنەوە لە خواو نەبیستنی قورئانو فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ دەستیان دەخستە ناو گوێچەکەیانەوەو سەری خۆیان دائەپۆشی تا هیچ نەبیسنو هیچ نەبینن، لێرەش دەفەرموێ: ئاگاداربن ئەو کاتەی کەوا لیباس ئەدەن بەخۆیاندا ﷲ ئاگای لەوە هەیە کە ئەیشارنەوە لەناو دڵیاندا، وەئەوەیش کە بە ئاشکرا ئەیکەن چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەوەی کەهەیە لەناو سنگەکاندا کەوابو چۆن شتی لێ ئەشارنەوە؟! هەندێ ئەڵێن: کۆمەڵێك لە خاوەن باوەڕان لەسەردەمی پێغەمبەرمان دا ﷺ کاتێ زانایيو ئاگایی خودایان بەچاکی زانی بەلایانەوە شەرم بو خۆیان بەروتی دەرخەنو بچنەلای خێزانەکانیان چونکە ئەیان وت: خوا چاوی لێمانە جا ﷲ ئەم ئایەتەی سەرەوەی رەوانە کردو فەرموی لەو بارەوە سەختگیری نیەو ئێوە هەرچی بکەن تەنانەت کە خۆتان دائەپۆشن لە شەوی تاریكو لە ناو ژوری خۆتاندا خوا ئاگاداری خەیاڵو خەتەرەی ناودڵەکانتانە کەواتە چی لێ ئەشارنەوە؟ بەڵێ شەرم لەخودا زۆر چاکە بەڵام دەبێ ئەوشەرمە زیان بەبیرو باوەڕ نەگەیەنێ، دڵنیابە هەرچی بکەیتوهەرچی بڵێیتوهەرچی لەناودڵتابێ، بەئاشکراو بە نهێنیو بەرۆژی رۆشناو بەشەوی زۆر تاریكو خۆت بپێچی بەدەیان شتەوە لای خودا وەکو یەکەو هەموی دەزانێ، جا بۆ ئەوەی زانیاری خۆی رون بکاتەوە بۆ خەڵك دەفەرموێ:

﴿٦﴾ ئەوسا هیچ شتێك نیە لەسەر ئەم زەوییەدا پێویستی بەیارمەتیو رۆزی هەبێ مەگەرخوا ئاگادارە لێیو بەلوتفی خۆی لەسەر خۆی پێویستکردوە کە بژێوی پێ بداتو دەزانێ لە کوێ دایە چ لەپێش بونو چ لەپاش بون، وەدەزانێ لە کوێدا بەئەمانەت دانراوە چ کاتێ لە پشتی باوکدایە یان لەناو رەحم یان لە ناو گۆڕ دایە چونکە هەموی پێش بونی ئینسان بەهەزاران ساڵ خوای زاناو کاربەجێ زانیویەتی کە هەموی تۆمارکراوە لە (لەوحی)پارێزراودا کە رۆشنکەرەوەی هەمو شتێکە. ئەمەش بەومانایە نیە کە مرۆڤ دانیشێو ئیش نەکات بە چاوەڕوانی کردنی تۆمارکراوی ناولەوح چونکە ئێمە ئاگامان لەونوسراوەنیە، بەڵکو پێویستە مرۆڤ خۆی هۆیەکانی بژێوی بگرێتەبەرو تەمەڵو تەوەزل لێی دانەنیشێت بەڵام چاوەڕوانی رۆزی هەر لە خوا بکات چونکە ئەگەر خوا رۆزی پێ نەدات ماڵی ناودەستیشی لەناوئەچێت، ئینجا ﷲ باسی دەسەڵات و هێزی خۆی دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٧﴾ جا خوا ئەو زاتەیە کە ئاسمانانو زەوی دروستکردوە لە شەش رۆژداو عەرشی خواپێش ئەوەی ئاسمانانو زەوی دروست بکات لەسەر ئاوبوە جا خوا ئەمەی کرد تاتاقیتان بکاتەوەو ئاشکرا ببێ کە کام لە ئێوە چاکتر ئیش دەکات، وە ئەگەر تۆ بڵێیت: بەڕاستی ئێوە زیندو دەکرێنەوە لە پاش مەرگ بەدڵنیاییەوە کافران باوەڕ ناکەنو دەڵێن: ئەمە بێجگە لە جادویەکی ئاشکرا شتێکی ترنیەو شتی وا ناگونجێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {قَالَ اللهُ عَز وَجَل أُنفِقْ أُنفِقْ عَلَيْكَ وَقَالَ يَدُ اللهِ مَلْأى لَا تَغِيضُهَا نَفَقَةٌ سَحاءُ اللَّيلَ وَالنهَارَ وَقَالَ أَرأَيْتُمْ مَا أَنفَقَ مُنذُ خَلَقَ السمَاءَ وَالْأَرضَ فَإِنهُ لَمْ يَغِضْ مَا فِي يَدِهِ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ وَبِيَدِهِ الْمِيزَانُ يَخْفِضُ وَيَرْفَعُ./البخاري/ ﷲ ی بەدەسەڵاتو بەشکۆ دەفەرموێ: ببەخشە پێت دەبەخشمو پێغەمبەرﷺ فەرموی: دەستی ﷲ پڕەو بەخشین هیچی کەم ناکاتەوە کە

نیعمەتی فرەوانەو بلاوی دەکاتەوە شەوو رۆژو فەرموی: ئایا ئەزانن کە لەو رۆژەوە کە خودا ئاسمانو زەوی دروستکردوە دەبەخشێت ، ئەوسا بێگومان ئەو بەخشینە هیچی کەم نەکردوە لەوەی کە لەناودەستیدایە وعەرشی لەسەر ئاوبوەو هەر بەدەست خۆیەتی کێشانە کەنزم دەکاتەوەو بەرزدەکاتەوە}.

(٨)خۆ ئەگەر ئێمە سزای ئەوان دوابخەین تاماوەیەکی ژمێرراو بەگاڵتەوە ئەڵێن: چی رێگای گرتوەو نایەڵێت سزامان بۆ بێت؟ ئاگاداربن لە رۆژێکدا دێت بۆیان کەهیچ شتێك ناتوانێ لایبدات لێیان، جا چونکە سزاو تۆڵەی بێ باوەڕان راستە دەفەرموێ: وەهاتە سەریان سزای ئەوشتەی کەئەوان بێ باوەڕبون پێی‌و گاڵتەیان پێ ئەکرد.

(٩)خۆ ئەگەر ئێمە مرۆڤ خۆشبەخت بکەین‌و نیعمەتی پێ بدەین لە پاشان لێی وەرگرینەوە ، بێگومان ئەو مرۆڤە هەم نائومێد ئەبێت‌وهەم خۆی توشی کوفر دەکات‌و بێزاری‌و ناڕەحەتی خۆی دەردەبڕێت بەرامبەر بەتەقسیماتی خوای زانا، بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی توندە لە مرۆڤ کە کاتێ لە خۆشی‌و نیعمەت دایە بەموڵکی خوای نازانێ‌و سوپاسی ناکات بەڵام کاتێ لێی سەندرایەوە بەکاری خوای دەزانێ‌و بەئیشەکان‌و بەشەکانی خوا رازی نابێ، جا هەم ناسوپاسە هەم عەجول، وەك دەفەرموێ:

(١٠)ئینجا ئەگەر ئێمە نیعمەتی خۆمانی پێ بدەین لەپاش ئەو تەنگوچەڵەمانەی کە توشی بون لە باتی سوپاسگوزاری‌و گەردن کەچی ئەڵێت: تازە ناخۆشی‌و تەنگوچەڵەمەم لەسەر لاچوو ئەم جۆرە روداوانە شتێکی سروشتین‌و هیچ پەیوەندییەکی بە کردارو رەوشتی منەوە نیەو دەسەڵات‌و هێزێکی تری نادیاری نیە، بەڕاستی ئەو بەو ئیشەی خۆی شادمانەو زۆر لوت بەرزەو لەو بەڵگە بەرزو بەنرخانەی خوا کەڵك وەرناگرن، بەڵام ئەوانەی کە بەڕاستی خوا ئەناسن لەهەمو بەرزو نزمی‌و خۆشی‌و ناخۆشییەکی ژیان پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن‌و لە کاتی نیعمەت دا سوپاسی خوا ئەکەن‌و لەکاتی تەنگوچەڵەمەو گرانیدا خۆگرو ئارام ئەبن وەك لێرەدا دەفەرموێ:

(١١)بێجگە لەوانەی کە خۆیان گرتوە لەکاتی تەنگانەداو سوپاسی خوایان کردوەو کرداری چاکیان ئەنجام داوە، ئەم بەشەی مرۆڤ خۆش بەختەو هەمیشە چاوەڕوانی خۆشی بۆخۆیان ئەکەن چونکە خوای میهرەبان دەفەرموێ:کە ئەوانە لێخۆش بونیان بۆ هەیە لەلایەن خوای خۆیانەوەوهەروەها پاداشتێکی گەورەش چونکە خۆگرو چاکە کاربوون لەژیاندا. بەڵێ بێ باوەڕان هەمیشە خەریکی هەڕەشەو پیلان نانەوە بوون‌و هەرگیز لە دوژمنکاری دەستیان نەکێشاوەتەوەو لایەنگرانی ئاینیان بە هەمو شێوەیەك

أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ فَأۡتُواْ بِعَشۡرِ سُوَرٖ مِّثۡلِهِۦ مُفۡتَرَيَٰتٖ وَٱدۡعُواْ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾ فَإِلَّمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَكُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَآ أُنزِلَ بِعِلۡمِ ٱللَّهِ وَأَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيۡهِمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فِيهَا وَهُمۡ فِيهَا لَا يُبۡخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيۡسَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُۖ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٞ مَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ وَيَتۡلُوهُ شَاهِدٞ مِّنۡهُ وَمِن قَبۡلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامٗا وَرَحۡمَةًۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۚ وَمَن يَكۡفُرۡ بِهِۦ مِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ فَٱلنَّارُ مَوۡعِدُهُۥۚ فَلَا تَكُ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُۚ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٧﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ يُعۡرَضُونَ عَلَىٰ رَبِّهِمۡ وَيَقُولُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ كَذَبُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمۡۚ أَلَا لَعۡنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٨﴾ ٱلَّذِينَ يَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجٗا وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٩﴾

چەوساندوەتەوەو بە توندی دژایەتی پێغەمبەریان ﷺ کردوە بەشێوەیەك کەگوایە ژیری وای مرۆڤ فێرکردوە!! با خۆی بدایە بەدەستەوەو ئاسانکارییان لە گەڵدا بکات چونکە هیچی تری پێ ناکرێت‌و ئەوان زۆرترو بەهێزترن، بۆیە ﷲ لێرەدا پێغەمبەرمان ﷺ ئامۆژگاری دەکات کە سست‌و لاواز خۆت پیشان نەدەیت‌و هیچ گوێ بە قسەی زل‌و هەڕەشەیان مەدەو زەرەیەك لە کاری خۆت نەکشێیتەوە، ئەوەتە دەفەرموێ:

(١٢) لەوانەیە کە تۆ واز بهێنی لە هەندێك لەو شتەی کە ئێمە وەحیمان کردوەتە لات‌و دڵت بەو قسەی ئەوان ناڕەحەتە کە ئەڵێن: ئەگەر راستە با خەزێنەیەکی بۆ بهاتایەو فەقیر نەبوایە یا با فریشتەیەکی لەگەڵدا بوایە تا باوەڕمان پێ بکردایە مادام هیچکامیانی نیە باوەڕی پێ ناکەین، ﷲ دەمکوتیان دەکات‌و دەفەرمێ: ئەی محمد ﷺ تۆ هەر ترسێنەرێکیت بۆئەوان‌و هیچ شتێکی ترت لەسەرنیەو تۆنابێ بەقسەی ئەوان ناڕەحەت‌و غەمگین ببی‌و سستی لە گەیاندنی ئەم پەیامەدا بکەیت‌و خوا بەسەر هەمو شتێکدا ئاگادارەو چاوی لێیەو ئاگای لە ئیشی تۆیش‌و ئەوانیش هەیە، بەڵێ هەر لەسەر مەسئەلەی پێغەمبەرایەتی ئەڕواوت‌و دەفەرموێ:

(١٣)ئەوان دەڵێن کە ئەو قسانەی تۆ قسەی خودا نیەو درۆ بەدەم خوداوە ئەکەیت؟ دەی ئەگەر راستەو قسەی خودا نیە ودروستکراوەپێیان بڵێ: با دە سوورەتی وەك ئەم قورئانە بهێنن

که دروستکراو بێتوکێ ئەتوانن بێجگە لە خوا بانگی بکەن ئەگەر ئێوە راست ئەکەنو ئەم قورئانە دروستکراوی دەستی منە. قورئان پێشەکی فەرموی: قورئانێکی وەك ئەم قورئانە بهێنن ئەگەر بەڕاستی نازانن نەیانتوانی پاشان لێرە فەرموی دە سورەت پاش ئەمەش وەکو لە سورەتی (بەقەرە)دا باسمان کرد فەرموی یەك سورەت بهێننو فەرمویشی ناتوانن بیهێنن جا ئەگەر کەسێك زانابێ هەر ئەمە بەسە بۆ ئەوەی بزانێت کەئەم قورئانە قسەی کەسێکە کەس بالادەستی نیەو باوەڕی پێ دەهێنن، لێرەش دەفەرموێ:

(١٤) جا ئەگەر ئەوانەی کە بانگیان لێ ئەکەنو داوای یارمەتیان لێ ئەکەن نەهاتنە کۆمەکتانەوە یان ئەگەر بێ باوەڕان وەڵامی ئێوەیان نەدایەوە، ئەی موسڵمانان دەی بابزانن کە ئەم قورئانە هەربەگوێرەی زانیاری خودایەو کەس توانای دژایەتی ئەم قورئانەی نیەو بزانن کەهیچ خودایەك نیە بێجگە لەو زاتە ، جا ئایا ئێوە موسڵمان نین؟ واتە: دەی موسڵمان بنو خۆتان لە گێلی مەدەن ، ئینجا ﷲ باسی ژیانو ئایندەی کافران دەکاتو دەفەرموێ:

(١٥) هەرکەسێك مەبەستی تەنها ژیانی دنیاو رابواردن بێو باوەڕی بە پاشە رۆژ نەبێو کارو کۆششی هەر بۆ دنیابێ ئێمە بەتەواوی هەرچیەکیان ئەوێ پێیان دەدەین لەم دنیایەدا وئەوان لەدنیادا زیانیان توش نایەتو ئاواتەکانیان بەزۆری دێتەجێ بۆ ئەو کەسەی کە خوا ئارەزۆ لێ بێ.

(١٦) ئا ئەوانە کەسانێکن کەلە رۆژی دوایی دا بێجگە لە ئاگر نەبێت هیچی تریان بۆ نیەو بەتاڵو هەلۆوشاوەیەو سودی لێ نابینن لە دوا رۆژدا لەوکردارانەی کە لە دنیادا کردویانە ،

(١٧) ئایا ئەو کەسەی کە لەسەر چاوڕۆشنیە لە لایەن خودای خۆیەوەو لە ئایین تێگەیشتوە وەشایەتێك لەلایەن خوداوە (کەجبرەئیلە) ئەوە قورئانە دەخوێنێتەوە ، وەپێش ئەو قورئانەیش پەڕاوی موسا بوە کە تەوراتە کە ئەو پەڕاوە پێشەواو رەحمەت بووەو باسی ئەم قورئانەیشی تێدا تۆمارکراوە وەکو ئەوکەسە وایە کە تەنها دنیای مەبەستە؟ نەخێر، جا ئەوانەی کە بەڕاستی باوەڕیان بەو پێشەواو رەحمەتە بوە ئا ئەوانە باوەڕ بەم قورئانەش ئەهێننو هەرکەسێکیش بەو قورئانەی کە محمد ﷺ هێناویەتی باوەڕنەکاتو بەبەرنامەی ژیانی خۆی نەزانێ لەو کۆمەڵانە ئەوسا جێگای ئاگرە بۆ هەمیشەو هەرگیز رزگاری نابێت واتە ئەو خەڵکە لە پاش هاتنی پێغەمبەرمان ﷺ هەموی بە ئومەتی ئەو حیسابەو هەرکەسێك باوەڕی پێ نەکات کافرەو ناچێتە بەهەشتەوە، جا نابێ تۆ لەم بارەوە گومانت هەبێ چ لە قورئاندا چ لە کافربونی ئەواندا بەڕاستی ئەمە بڕیارێکی راستە لەلایەن خوای خۆتەوە، کە قورئان پەڕاوێکی راستەو کافران دۆزەخ جێگایانە بەڵام زۆربەی خەڵك باوەڕ ناهێنن، ئینجا ﷲ زیاتر خراپیو ناپاکی کافرانو سزاکانیان باس دەکاتو دەفەرموێ

(١٨) کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە درۆی بەدەم خوداوە کرد بێت؟ ئا ئەوانە لە رۆژی قیامەتدا ئەبرێنە دادگای خوداو حیسابیان لەگەڵدا دەکات، وە شایەتەکان هەمویان لەو کاتەدا ئەڵێن: ئائەمانە بوون کە درۆیان بەدەمی خوای خۆیانەوە ئەکرد جا جاڕچی جاڕئەداتو ئەڵێ: ئاگاداربن نەفرینی خوا لە ستەمکارانە.

عەبدوڵای کوڕی عومەر دەڵێت لە پێغەمبەری خوا بیستم کە فەرموی: {**إن الله يُدني المؤمن فيضع عليه كنفه ويستره فيقول أتعرف ذنب كذا أتعرف ذنب كذا فيقول نعم أي رب حتى إذا قرره بذنوبه ورأى في نفسه أنه هلك قال سترتها عليك في الدنيا وأنا أغفرها لك اليوم فيعطى كتاب حسناته وأما الكافر والمنافقون فيقول الأشهاد هؤلاء الذين كذبوا على ربهم ألا لعنة الله على الظالمين** /**البخاري**/ بەڕاستی ﷲ باوەڕداران لە خۆی نزیك دەکاتەوە جا دای دەپۆشێت ئەوسا پێی دەفەرموێ: فلانە گوناهت لەبیر دێت جا یەڕێ: بەڵی ئەی پەروەردگارم، فلانە گوناهت لەبیر دێت جا یەڕێ: بەڵی ئەی پەروەردگارم، جا ئەو کاتەی کە دانی پێدا نا بە گوناهەکانیو هەستی کرد ئیتر لەناوچوە پەروەردگار پێی دەفەرموێ: لە دنیادا ئەو گوناهانم داپوشاندی جا ئەمرۆش چاوپشیان لێدەکەم بۆت ئەوسا کتێبی چاکەکانی پێدەترێت، بەڵام بۆ کافرانو مونافقان جا جاڕچی جاڕئەداتو ئەڵێ: ئاگاداربن نەفرینی خوا لەتەواوی ستەمکارانە.} ئینجا پیشەی ستەمکاران رۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(١٩) ئەو کەسانەی کەوا ئەبن بە بەرپەرچ لە رێگای خوداو نایەڵن خەڵکی بەرێگای ئەودا بڕواتو باوەڕ بهێننو ئەو ئایینەی ﷲ بە شێوەیەکی لارو نارێك پیشانی خەڵکی ئەدەنو هەوڵ ئەدەن کەلە بەرچاوی خەڵك ناشیرینی بکەن تا بتوانن خەڵکی لێ دور بخەنەوەو بیانکەن بە دوژمنی ئایین وخواناسان، ئەمانە بۆیە وابێ ترسانە دژایەتی ئەم ئایینە دەکەن چونکە ئەوانە بێ باوەڕن بە رۆژی دوایی، واتە: ئەو کەسانەی کەئەم وەسفانەیان تێدا بو ستەمکارنو بەر نەفرینی خوا ئەکەون.

(٢٠) ئەوانە ناتوانن بەرگری لەسزای خوا بکەنو لە دەستی بڕیاری دەربچن و نەیەڵن کە هیچیان پێ بکات بەڵکو ﷲ بەهێزو دەسەڵاتی خۆی هەرچی بیەوێت لەگەڵیان دەکاتو بۆ ئەوانە بێجگە لە خوا هیچ یارمەتی دەرێکیان نیەو خوایش یارمەتیان

نادات، لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزایان بۆ چەند بەرامبەر دەکرێتەوە چونکە ئەوانە ناتوانن کەببیستن‌و نابینن ئەگەر چی گوێچکەو چاویشیان هەیە، چونکە خۆیان کەڕو کوێر کردوە نە قسە باشەکانیان بیستووەو نەلەوهەمو نیشانانەی بەرچاویان سودیان وەرگرتوەو لە دوا ڕۆژیشدا خۆیان دان بەم ڕاستیەدا ئەنێن وەك لەئایەتی دەهەمی سورەتی مولك دا هەیە ( ئەگەر بمان بیستایەو عەقڵمان بوایە ئێستا لەناو ئەم ئاگرە سوتێنەرەدا نەدەبوین)، ئینجا ﷲ سەبارەت بەمانە دەفەرموێ:

(٢١) ئەوان بەڕاستی نەفسی خۆیان دۆڕاندوەو ون بوە لێیان ئەو درۆو دەلەسانەی کەلەدنیادا دروستیان کردبو.

(٢٢) بەڕاستی ئەوان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەنجەڕۆ ترین کەسن. وشەی(**لاجرم**)واتە، حەق‌و سابتەو وایە، ئینجا خوا باسی چاکان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٢٣) بێگومان ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوەو هەمیشە بەرەو خوای خۆیان هاتون‌و خۆیان بەکەم‌و گەردنکەچ پیشانداوە ئائەوانە ڕەفیقی دەستە ملی بەهەشتن وئەوانە بۆ هەمیشەیی لەناویدا ئەمێننەوە. ئینجا خوا وێنەی ئەو دوو کۆمەڵە بەم شێوەیە باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٢٤) وێنەی ئەو دوو کۆمەڵە وەکو کوێرو کەڕو بینەرو بیسەرە. واتە کافر کوێرو کەڕەو باوەڕدار بیسەرو بینەرە دەی ئەو کەسەی کە هۆشی هەبێ بۆ ئەبێ خۆی بباتە ئەو ڕیزەی کە کوێرو کەڕە؟! ئایا ئەم دوو وێنەیە وەکو یەکەن؟ نەخێر. دەی ئایا ئێوە هەر بیر ناکەنەوە؟ واتە حەق وایە بیر بکەنەوەو ژیری خۆتان بخەنەکارەوە تا کار لە کار نەترازاوەو تەوبە بکەن‌و بەو ماوەی کە ماوتانە پێشوی خۆتان چاك بکەنەوە تا بەهەشت لەدەست نەدەن ونەچنە ناو ئاگرەوە، ئینجا ﷲ بۆ زیاتر ڕۆشنکردنەوەی ئایندەی چاکەکاران‌و خراپەکاران داستانی چەند پێغەمبەرێك باس دەکات کە سەرئەنجام چاکەکاران چییان دەستکەو توەو خراپەکارانیش بە چ ڕۆژێکی ڕەش گەیشتون، لەم سورەتەدا یەك بەدوای یەکداباسی نوح وهودو ساڵح‌و لوت وشوعەیب‌و موسا (علیهم السلام) کراوە و دەفەرموێ:

(٢٥) وەبەڕاستی ئێمە نوح پێغەمبەرمان نارد بۆلای گەلەکەی وتی: بێگومان من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە، نوح ﵇ یەکێکە لەو پێغەمبەرانەی کە تەمەنێکی درێژی کردوەو زۆر ماندوبوە بەبانگ کردنی گەلەکەی بۆ خوا پەرستی‌و وازهێنان لە شیرك‌و بت پەرستی ، بەڵام ئەو گەلە زۆر نارێك‌و لاسار بوون‌و زۆر دژایەتی ئەوپێغەمبەرەیان کردوەو ژمارەیەکی زۆرکەم

أُوْلَٰٓئِكَ لَمۡ يَكُونُواْ مُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنۡ أَوۡلِيَآءَۘ يُضَٰعَفُ لَهُمُ ٱلۡعَذَابُۚ مَا كَانُواْ يَسۡتَطِيعُونَ ٱلسَّمۡعَ وَمَا كَانُواْ يُبۡصِرُونَ (٢٠) أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ (٢١) لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ (٢٢) إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَأَخۡبَتُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٢٣) ۞ مَثَلُ ٱلۡفَرِيقَيۡنِ كَٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡأَصَمِّ وَٱلۡبَصِيرِ وَٱلسَّمِيعِۚ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ (٢٤) وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ (٢٥) أَن لَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ (٢٦) فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ (٢٧) قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِهِۦ فَعُمِّيَتۡ عَلَيۡكُمۡ أَنُلۡزِمُكُمُوهَا وَأَنتُمۡ لَهَا كَٰرِهُونَ (٢٨)

باوەڕیان پێ هێناوەو ماوەی دەعوەتەکەی نۆسەد وپەنجا ساڵ بوە لەم سورەتەدا بەشێکی زۆر لەبەسەرهاتی باسکراوە، ئەڵێن لەو ماوە زۆرەدا حەفتاودوو پیاوو ئافرەت باوەڕیان پێ هێناوە هەندێك ئەڵێن: هەشتا کەس کە ئەمەش لای سەرەو لەمە زیاتر نەبون، بەڵی خوای میهرەبان بۆ ڕزگارکردنی خەڵك لە بت پەرستی‌و گومڕاهی‌و گەیاندنیان بۆ بەهەشت پێغەمبەرانی یەك لە دوای یەك ڕەوانەکردوەو هەمویشیان یەك مەبەستیان بووە کە بەندایەتی خودا بکەن‌و هاوبەشی بۆ دانەنێن وەك لێرەدا دەفەرموێ:

(٢٦) نوح بەگەلەکەی وت: بێجگە لەﷲ بەندایەتی بۆ هیچ شتێکی تر نەکەن، چونکە ئەگەر بەندایەتی بێجگە لەو بکەن بێگومان من ئەترسم کە ئێوە دوچاری سزای پڕمەترسی ودەردناك ببن، چ کاتی هاتنی تۆفان یان هاتنی قیامەت، جا لە جیاتی سوپاسکردن‌و گوێڕایەڵی کەوتنە گاڵتەپێ کردنی‌و سوك تەماشا کردنی خۆی‌و بانگەوازەکەی‌و پەیڕەوانی،

(٢٧) ئەوە بو ئەشرافی گەلەکەی‌و ئەوانەی کە بێ باوەڕبوون وتیان: ئێمە تۆ بێجگە لەوەی کەبە بەشەرێکی وەکو خۆمانت دەزانین شتێکی زیاتر لە وە نیت‌و ئێمە نابینین ئەو کەسەی کە پەیڕەوی تۆیە مەگەر ئەوانەی کە زۆر سوك‌و سادەن لە ناو ئێمەداوروالەت بینن‌و لە شت تێ ناگەن، وە ئێمە وانازانین کە

وَيَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مَالًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۚ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۚ إِنَّهُم مُّلَٰقُواْ رَبِّهِمۡ وَلَٰكِنِّيٓ أَرَىٰكُمۡ قَوۡمٗا تَجۡهَلُونَ ﴿٢٩﴾ وَيَٰقَوۡمِ مَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِن طَرَدتُّهُمۡۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٣٠﴾ وَلَآ أَقُولُ لَكُمۡ عِندِي خَزَآئِنُ ٱللَّهِ وَلَآ أَعۡلَمُ ٱلۡغَيۡبَ وَلَآ أَقُولُ إِنِّي مَلَكٞ وَلَآ أَقُولُ لِلَّذِينَ تَزۡدَرِيٓ أَعۡيُنُكُمۡ لَن يُؤۡتِيَهُمُ ٱللَّهُ خَيۡرًاۖ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا فِيٓ أَنفُسِهِمۡۖ إِنِّيٓ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدۡ جَٰدَلۡتَنَا فَأَكۡثَرۡتَ جِدَٰلَنَا فَأۡتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ إِنَّمَا يَأۡتِيكُم بِهِ ٱللَّهُ إِن شَآءَ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَنفَعُكُمۡ نُصۡحِيٓ إِنۡ أَرَدتُّ أَنۡ أَنصَحَ لَكُمۡ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغۡوِيَكُمۡۚ هُوَ رَبُّكُمۡ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٣٤﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۖ قُلۡ إِنِ ٱفۡتَرَيۡتُهُۥ فَعَلَيَّ إِجۡرَامِي وَأَنَا۠ بَرِيٓءٞ مِّمَّا تُجۡرِمُونَ ﴿٣٥﴾ وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُۥ لَن يُؤۡمِنَ مِن قَوۡمِكَ إِلَّا مَن قَدۡ ءَامَنَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾

ئێوە هیچ فەزڵو جیاوازیەکتان هەیە بەسەر ئێمەدا بەڵکو ئێمە وا گومان دەبەین کە ئێوە درۆ ئەکەنو ئێوە پێغەمبەری خودا نین. هەروەك ئەمڕۆ هەر موسڵمانێك بجوڵێتەوە بەسادەو ساویلکەو بێ تەجرەبە ناو ئەبرێنو قسەکۆنەکان بە با دەکەنەوەو خۆیان بەزاناو فامیدەش دەزانن؟! ئینجا اللّٰه وەڵامی نوحمان بۆ تۆمار دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٨) نوح وتی: ئەی گەلی من پێم بڵێن ئەگەر من لەسەر ڕێگای ڕاستو چاو ڕۆشنی لەلایەن پەروەردگارمەوە بمو ئەو زاتە لەلایەن خۆیەوە پەیامی ڕەحمەتو سۆزی بە من دابێ بەڵام ئەم ڕاستیە لەلای ئێوە شاراوە بێتو لێی تێ نەگەن تاوانی من چییە ، ئایا من هەر بە زۆر ئێوە بچەسپێنم بەئەم ڕەحمەتو پەیامەی خوداوە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئێوە ڕقتان لێی بێت؟! واتە : شتی وانابێو ئەبێ ئێوە لەم پەیامە حاڵی ببنو بەدڵەوە وەری بگرنو ئیشی پێ بکەن ئینجا ئێوە ئەبن بەخواناسو خۆشیو سەعادەتی پاشە ڕۆژتان دەست ئەکەوێت نەك بەزۆرو ناچاری گەردنکەچ بکەن وەك لە سورەتی بەقەرەدا دەفەرموێ:﴿لا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ/ زۆر کردن لە باوەڕ هێناندا نیە﴾ و لەوێ ئەم باسە قسەی زیاتری لە سەر کراوەو دووبارەی ناکەینەوە.

(٢٩) ئینجا نوح زیاتر بەراگەیاندنی پەیامەکەیەوە خەریك ئەبێو ئەڵێ: ئەی گەلی من باش بزانن کەمن لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە بە ئێوە داوای ماڵ وسامان ناکەم تا بڵێن بارمان قورسەو بۆمان ئەنجام نادرێت، من لەسەر ئەم بانگەوازە هیچ پاداشتم نیە بێجگە پاداشتی لای خوا، ئینجا وتیان تۆ ئەم سادەو کەم فامانەی دەوری خۆت دەرکە، وتی: ئەوسا من هەرگیز ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو پەیڕەوی ئایین دەکەن دەریان ناکەم بێگومان کە ئەوانە ئەگەن بەخوای خۆیانو بەهرەی خۆیان وەرئەگرن بەڵام بێگومان من واتان دەبینم کەئێوە گەلێکن خۆتان نەزان دەکەن.

(٣٠) ئەی گەلی من کێ یارمەتیم ئەداتو ڕزگارم دەکات لەدەست سزای اللّٰه ئەگەر من ئەوان بتۆرێنمو دەریان بکەم؟ دەی ئایا ئێوە بیر ناکەنەوەو لە دژایەتیم دەس هەڵگرن.

(٣١) خۆ من ناڵێم بە ئێوە کە خەزێنەکانی اللّٰه لەلای منەو هەرکەس هەرچی ویست پێی دەبەخشمو من غەیب نازانمو من ناڵێم کە فریشتەمو هەرگیز بەوانەیش کە لە بەرچاوی ئێوەدا سووکنو بە نەفامو نەزانیان ئەزانن ناڵێم اللّٰه هیچ چاکەو خێرتان پێ نادات چونکە خوا خۆی دەزانێت بەوەی کەلە ناو دڵی ئەواندا هەیە جا ئەگەر من پاڵ بەوانەوە بنێم لەبەر دڵی ئێوەو لە خۆمیان دوور بخەمەوە بێگومان من ئیتر هەر لەو کاتەدا لە ستەمکارانم. بەڵێ ئەو گەلە لاسارە لە جیاتی پەشیمان بونەوەو پەیڕەوی کردنی نوح،

(٣٢) وتیان: ئەی نوح بەڕاستی تۆ کێشەو باست کردوە لە گەڵ ئێمەدا ، ئەوسا لە سنورت تێ پەڕاندوەو زۆردەمەدەمەت کردوە لەگەڵمان دا بەسە ئەگەر لە ڕاستگۆیانی بائەو سزایە بێت کە ئێمەت پێ دەترساند ئیتر قسەو باس بەسەو باوەڕت پێ ناکەین.

(٣٣) نوح وتی: ئەو سزایە نایەت مەگەر خوا خۆی بیهێنێت ئەگەر ئارەزۆی لێ بێتو ئێوە ناتوانن خوا دەستە پاچە بکەنو ڕێگا لەو سزایە بگرن هەرکاتێ هات.

(٣٤) خۆ سودی نابێت بۆ ئێوە ئامۆژگاریەکانم ئەگەر چی من ئەمەوێ بەچاکی ئامۆژگاریتان بکەم بەڵکو ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە مادام خوا بیەوێ ئێوە سەر لێ شێواو گومڕا بکات، واتە: هەمو شت بەدەست خودایەو مرۆڤ ئەبێ ڕێنمایو هیدایەت هەرلە خوا داوابکاتو خۆی لە خوا بێ نیاز نەزانێ چونکە هەرخۆیەتی پەروەردگارتانو هەرچی ئارەزۆ بکات هەر ئەوە دەبێ، وە هەر بۆلای ئەو دەگەڕێنەوە. جا لە باتی وەڵام دانەوەی بەچاکی وباوەڕپێ هێنانی زیاتر دژایەتیان دەکرد.

(٣٥) بەڵکو ئەیان وت: ئەمە هەڵبەستراوی دەستی خۆیەتیودرۆ بەدەم خوداوە دەکات، پێیان بڵێ: ئەگەر من ئەم پەیامەم هەڵبەستبێتو درۆ بە دەم خوداوە بکەم خۆ تاوانەکەی لەسەرخۆمەو ئێوە زیان ناکەنو من بەریمو دوورم لەو درۆو تاوانانەی کە ئێوەدەیلێنو دەیکەن. هەندێك دەڵێن: ئەم ئایەتە قسەو دژایەتی کافرانی مەکەیەو وەڵامی پێغەمبەرمانە بۆ ئەوان بەڵام مانای ئەوەڵ نزیکترە و باسەکەی نوح لە یەکتر نابچڕێت ، ئینجا پاش ئەو تاڵو سوێریە زۆرەی کە نوح ﵇ لەسەر بانگی گەلەکەی بۆ ئاییینی خوداو وازهێنان لە بت پەرستی، خوای گەورەو زانا نوحی ئاگادار کردەوە کەکاتی هاتنی سزا نزیکە چونکە ئەو گەلە تازە هیچ خەێریان تێدا نەماوە، دەفەرموێ:

(٣٦) وەحیمان کردە لای نوح کە ئیتر هیچ کەس لەو گەلەی تۆ باوەڕ ناهێنێت بێجگە لەو کەسەی لەپێش ئیستادا باوەڕی هێنا بێت ، جا کەوابو تۆ نائومێد مەبە بەو کارانەی کە ئەوان دەیکەنو هەرچی ئەکەن با بیکەن تۆ خەریکی شتێکی تر ببە، ئەویش دروستکردنی کەشتییەکە لەو وشکاییەدا وەك خوای گەورەو زانا دەفەرموێ:

(٣٧) وتمان: لە ژێر ڕێنمایو چاودێریو نیگای ئێمەدا کەشتیەك دروست بکەو ئیتر تۆ لە بارەی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان نەهێناوەو ستەمیان لە خۆیان کردوە قسەم لەگەڵدا مەکەو تکایان بۆ مەکە ،چونکە ئەوان ئەخنکێنرێن.

(٣٨) جا دەستی کرد بە دروستکردنی کەشتی. خۆ ئیتر دەمیان کرایەوە بۆ تانەو تەشەر لێدانی چونکە کەشتی پێویستی بەوە بو چەند ساڵێك ئەو درەختانە بنێژرێ کە تەختەی لێ دروست ئەکرێت، جا وتیان: وازی لە پێغەمبەرایەتی هێناوەو خەریکی باخەوانیەو پاش بڕانی دارەکانو تاشینو بە تەختەکردنیان دیارە ئەویش ماوەیەکی بردوەو وتیان: وازی لەویش هێنا واخەریکی دارتاشیە ، جا کاتێك خەریکی دروستکردنی کەشتیەکە بو زیاتر دەمیان کرایەوەو ئەیان وت: ئێمە زوو وتمان کە ئەم پیاوە شێتە ئەوەتە لەم وشکاییەدا خەریکە کەشتی دروست دەکات، ئا بەم شێوەیە ئازاریان ئەداو گاڵتەیان پێ ئەکردو هەر کاتێك کۆمەڵێك لە گەلەکەی بەلایدا تێپەڕبونایە گاڵتەیان پێ کردوەکە نوحیش ﵇ پێیدەوتن ئەگەر ئێوە ئێستا گاڵتە بەئێمە دەکەن، بێگومان کە ئێمەش گاڵتە بە ئێوە دەکەین ئەو کاتەی کەسزاتان بۆ هات وەکو ئێستا ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن.

وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُوا۟ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُوا۟ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ وَهِىَ تَجْرِى بِهِمْ فِى مَوْجٍ كَٱلْجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبْنَهُۥ وَكَانَ فِى مَعْزِلٍ يَٰبُنَىَّ ٱرْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِىٓ إِلَىٰ جَبَلٍ يَعْصِمُنِى مِنَ ٱلْمَآءِ ۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ ۚ وَحَالَ بَيْنَهُمَا ٱلْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُغْرَقِينَ ﴿٤٣﴾ وَقِيلَ يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَنَادَىٰ نُوحٌ رَّبَّهُۥ فَقَالَ رَبِّ إِنَّ ٱبْنِى مِنْ أَهْلِى وَإِنَّ وَعْدَكَ ٱلْحَقُّ وَأَنتَ أَحْكَمُ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٤٥﴾

(٣٩) ئەوسابەم زوانە ئەزانن چ کەسێك سزایەکی سەر شۆڕکەری بۆ دێت و بەسەرکێدا سزای هەمیشەیی ئەچەسپێت؟ بەسەر منو پەیرەوانم یان بەسەر ئێوەی بێ باوەڕو بت پەرستو نەزان؟ بەڵێ ئەم گەلە لەسەر بێ باوەڕی خۆیان سووربونو نوحیش کەشتی خۆی تەواو کرد ، جا نوح عەرزی پێشگای خودای کرد کە چۆن بزانم سزا کەی دێتو بەچی هەستی پێ بکەم تا پەیڕەوانم ئاگاداربکەمەوەو سواری کەشتی ببن، خودایش پەیامی بۆ نارد کە هەرکاتێ ئاوت دی هاتە دەرەوەلەو تەنورەی کە هەتانە ئەوە بزانە کاتی سزایە وەك دەفەرموێ:

(٤٠) سا کاتێ فەرمانی ئێمە هاتو ئەو تەنوورە ئاوی لێ هەڵقوڵا، جا خوا دەفەرموێ: وتمان لەهەمو نێرو مێیەك جوتێك بخەرە کەشتیەکەوەو خاو خێزانی خۆتیش بێجگە لەوەی کە بڕیاری خنکانی لەلایەن ئێمەوە دراوە وەك کوڕەکەی، وە هەروەها باسواری ئەو کەشتیە ببن ئەو کەسەی کە باوەڕی هێناوە، خۆ باوەڕیشی نەهێناە بەو پێغەمبەرە بێجگە لە کۆمەڵێکی کەم کە لە ژمارەیاندا ناڕێکی هەیە وەك لەپێشدا باسمانکرد . بەڵێ کاتێ نیشانەی سزا دەرکەوت نوح پەیڕەوانی بانگ کرد،

(٤١) وتی: بەناوی خوداوە سواربن کەئەم کەشتیە هەر بەناوی ئەو زاتەوە دەڕوات ودەوەستێتو فەرمان هەرلەدەست خۆیدایەو چۆنو لە کوێو کەی دەوەستێت هەرخۆی دەزانێت بێگومان

قَالَ يَٰنُوحُ إِنَّهُۥ لَيۡسَ مِنۡ أَهۡلِكَۖ إِنَّهُۥ عَمَلٌ غَيۡرُ صَٰلِحٖۖ فَلَا تَسۡـَٔلۡنِ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۖ إِنِّيٓ أَعِظُكَ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلۡجَٰهِلِينَ ﴿٤٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِكَ أَنۡ أَسۡـَٔلَكَ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞۖ وَإِلَّا تَغۡفِرۡ لِي وَتَرۡحَمۡنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٤٧﴾ قِيلَ يَٰنُوحُ ٱهۡبِطۡ بِسَلَٰمٖ مِّنَّا وَبَرَكَٰتٍ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ أُمَمٖ مِّمَّن مَّعَكَۚ وَأُمَمٞ سَنُمَتِّعُهُمۡ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٤٨﴾ تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَاۖ فَٱصۡبِرۡۖ إِنَّ ٱلۡعَٰقِبَةَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمۡ هُودٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۖ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا مُفۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوۡمِ لَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًاۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱلَّذِي فَطَرَنِيٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِ يُرۡسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيۡكُم مِّدۡرَارٗا وَيَزِدۡكُمۡ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمۡ وَلَا تَتَوَلَّوۡاْ مُجۡرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُواْ يَٰهُودُ مَا جِئۡتَنَا بِبَيِّنَةٖ وَمَا نَحۡنُ بِتَارِكِيٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوۡلِكَ وَمَا نَحۡنُ لَكَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٣﴾

پەروەردگارم زۆرلێ بوردەو بەسۆزە بۆ بەندەکانی . ئینجا ﷲ بارودۆخەکە ئەخاتە بەرچاو وەك ئەوەی کە ئێستا شتەکە روبداتو دەفەرموێ:

(٤٢) وە ئەو کەشتیە ئەیانبات لەناو شەپۆلی ئەو ئاوەدا کەهەر شەپۆلێکی وەك چیایەك وایە، نەیفەرمو: {جرت/بردنی. فەرموی: ﴿ تَجۡرِي بِهِمۡ ﴾ /دەیانبات} بەڵێ پەیرەوان و خاو خێزانی نوح سواری کەشتی بون بێجگە لە کوڕێکی کەناوی(کەنعان یان یام) بو، جا نوح ﷺبانگی کوڕەکەی خۆی کرد لە حاڵێکدا کەئەو کەناری گرتبوو لە باوکیو نەهاتبوە ناو کەشتیەکەوەو وتی: ئەی کوڕی خۆم وەرە لەگەڵ ئێمەدا سواری ئەم کەشتیە ببە وتۆ لەگەڵ کافراندا هاوبیروڕا مەبە. دیارە نوح ﷺ نەیزانیوە کە منافقە.

(٤٣) کوڕەکەی وتی: من دەچمە سەر چیایەك کەلەم ئاوە دەم پارێزێت وتی: ئەمرۆ هیچ کەسێك ناپارێزەرێت لە بڕیاری ﷲ ولەوتۆفانەی کە رەوانەی کردوە مەگەر کەسێك خوا رەحمی پێ بکاتو بیپارێزێت ، جا لەم قسانەدا بون ئەو شەپۆلە گەورەی کە باس کرا کەوتە نێوان باب وکوڕو ئەویش چووە ریزی خنکاوەکان. ئابەم شێوەیە کۆتای بە تەمەنی تاوانباران هاتو نوحو پەیڕەوانی لەسەر کەشتین،

(٤٤) ئینجا لەو کاتەدا وترا ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت دەرەوەو ئەی ئاسمان ئاوی خۆت بگرەوەو ئینجا ئاوەکە کەم بویەوەو وشکانی دەرکەوتوبڕیاری خوا کە لەناو بردنی خراپان بوو جێ بەجێ کراوکەشتیەکە لەسەر کێوی جودی وەستا، وا مەشهورە کە چیایەکە لە کوردستانی تورکیادا. وە بێژرا دووریو نەفرینی خوا بۆ هەمو گەلێکی ستەمکار. بەڵێ ئەونەمانوتێداچوونە ئایندەی هەمو گەلێکی ستەمکارە لەکۆنو ئێستاو ئایندەشدا ئەگەرچی جۆری سزایشیان وەك یەك نەبێت، ئینجا ﷲ دێتە سەر باسی کوڕەکەی نوحو دەفەرموێ

(٤٥) نوح ﷺبانگی لە پەروەردگاری خۆی کردو وتی: ئەی پەروەردگارم، بێگومان کوڕی من لە ئەهلی منەو تۆ بەڵێنت دا کە ئەهلی من بپارێزیو بێگومان وەعدی تۆ راستەو بەڕاستی تۆ لە هەمو فەرمانڕەوایان داد پەروەرترو فەرمانڕەواتری بۆیە چاوەڕوانی پارێزگاری کوڕەکەم لێ دەکردیت ، خوای میهرەبانو زاناو کاربەجێ وەڵامی نوحی دایەوە،

(٤٦) فەرموی: ئەی نوح ئەوە ئەهلی تۆ نیە. بۆ؟ چونکە بەبێشك کە ئەو کردارێکی ناپاكو رەوشتێکی نارێکی هەیە ،واتە: مونافقەو لەناو دڵدا باوەڕی بە تۆ نیە جا داوای ئەو شتەم لێ مەکە کە زانایت لە بارەیەوە نیە، بێگومان من ئامۆژگاریت دەکەم نەوەك تۆ بەم داخوازییەت بچیتە ریزی نەفامانەوە. لێرەدا دوشتی گرنگ هەیە:

**یەکەم** ـ نوح پێغەمبەرێکی خودایەو ئاگای لەناو دڵی کوڕەکەی نیە.

**دووهەم** ـ پایەو پلەی بەرزی پێغەمبەرایەتی نوح نەیتوانی کوڕەکەی رزگار بکات لە سزای ﷲ چونکە کافر بو، جا ئەوانەی کەدەم لە نهێنی ئەکوتنو بێ کرداری چاك بەتەمای تکاو شەفاعەتی کەسانی ترن باسەری شەرمەزاری داخەنو لەو بۆچونە هەڵەیە وازبهێنن، نوح کوڕو ژنێکی بەکافری مردنو لوت ژنی بەکافری مرد وەك لە سورەتی (التحریم)دا باسکراوە.

(٤٧) ئینجا نوح ﷺ کاتێ بەو راستیەی زانی بێ وەستانو بەپەلە، وتی: ئەی پەوەردگارم بێگومان من پەنا ئەگرم بە تۆ کە داوای شتێکت لێ بکەم کە زانیاریم لە بارەیەوە نەبێت بەڕاستی ئەگەر تۆ لێم خۆش نەبیو رەحمم پێ نەکەی ئەوە من لە ریزی ئەو مرۆڤە زیان لێ کەوتو رەنجەڕۆیانەم کە بەر سزاو نەفرینی تۆ کەوتون واتە: نوح لە داواکەی پەشیمان بویەوەو لەو خوایەی کە غەفورو رەحیمە داوای لێ خۆشبونو رەحمی کرد خواش وەڵامی دایەوە،

(٤٨) بێژرا ئەی نوح دابەزەو لەلایەن ئێمەوە ئەمنو ئاسایشت پێدرا وفەڕو بەرەکەتت دادەبارێتە سەر، واتە: دڵت تەنگ نەبێت هەم ئاسودە دەبیت هەم نازو نیعمەتت پێ دەدرێت، وە هەروەها سەلامو رەحمەتو بەرکەت لەسەر ئەو ئوممەتە بێت کە لەگەڵ تۆدایە وگەلانێکی تر کە لەمەولا ئەیانژێنین تاماوەیەك ولەپاشدا ئەوانیش لە بەرنامەی ئێمە لائەدەنو سەرپێچی پێغەمبەران ئەکەن لەبەر ئەوە لەلایەن ئێمەوە سزای دەرد ناكوبەژانیان پێدەگات.

(٤٩) ئەو داستانەی کە باسمان کرد بەشێکە لە هەواڵە نەزانراوەکان کە ئێمە وەحیمان کردە لای تۆ نەتۆ ئەتزانیو نەگەلەکەت لە پێش هاتنی ئەم قورئانەدا کەوابو تۆش خۆت بگرە لەسەر ئێشو ئازاری قسە ناشیرینەکانی گەلەکەتو دڵنیابە کە پاشە رۆژ بۆ ئەو کەسانەیە کەلە خوا ئەترسنو خۆیان لە خراپەو خراپەکاری ئەپارێزن. ئینجا خوای میهرەبان داستانی گەلی عاد کە هودعليه السلام پێغەمبەریان بوە باس دەکات ودەفەرموێ:

(٥٠) جا ناردمان بۆلای گەلی عادیش براکەیان کە هود پێغەمبەر بو ، وتی ئەی گەلی من: الله بپەرستن چونکە هیچ خودایەکی تر نیە بۆ ئێوە بێجگە لەو بەراستی ئێوە هەر گەلێکی درۆزنن کەئەو هەموخودا جۆراو جۆرانەتان بەدرۆوە دروستکردوە بۆ خۆتان. لێرە ئەوە دەرئەکەوێت کە دروستە لە جیهەتی ئینسانیەوە بەهەرکەسێك بڵێیت برا با کافریش بێت.

(٥١) ئەی گەلی من لەسەرگەیاندنی ئەم بانگەوازە داوای هیچ خەرجیو پاداشتێك لە ئێوە ناکەم، هیچ پاداشتێکیشم نیە مەگەر لەلای ئەو کەسەی کە دروستی کردوم کە الله یە دەی ئایە ئێوە عەقڵتان نیەو بیر ناکەنەوەو ژیری خۆتان ناخەنەکارەوە تا سوودو زیانی خۆتان بزانن؟!

(٥٢) ئەی گەلی خۆم داوای لێخۆشبون لە پەروەردگارتان بکەن لەپاشان هەوڵدەن هەمیشە بگەڕێنەوە بۆ لای ئەو پەروەردگارەی کە زۆرو بەلێشاوو لەئاسمانەوە ئاوتان بۆ بنێرێتو چەندتان هێزو قوەت هەیە ئەوەندەی ترهێزو قوەتتان بۆ زیاتر بکات، وە ئێوە پشت مەکەنە ئەو ئایینە کەببنە ستەمکارو تاوانبار. بەڵام ئەو گەلە ستەمکارە وەك گەلانی پێش خۆیان دژی وەستان ،

(٥٣) وتیان ئەی هود: تۆ هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرات نەهێناوە بۆ ئێمەو ئێمەیش هەروا بەقسەی تۆ واز لە خواکانی خۆمان ناهێنینو ئێمە باوەڕت پێ ناکەین.

إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ ۞ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ وَٱسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَٱسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُوا۟ يَٰصَٰلِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَآ ۖ أَتَنْهَىٰنَآ أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِى شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾

(٥٤) ئێمە هیچ قسەیەکمان لەگەڵ تۆدا نیە بێجگە لەوەی کە ئێمە وائەزانین کە هەندێ لە خوداکانی ئێمەدەستیان لەتۆ وەشاندوەو تۆیان دوچاری شێتی کردوە، جا هودیش وتی: من خودا بە شایەت ئەگرم لەسەر راستی خۆمو ئێوەش هەموتان شایەت بن کەمن ئەم پەیامەم پێ راگەیاندونو بێگومان کەمن بێزارو بێوەریم لەو شەریکانەی کە ئێوە بۆ خودای دادەنێن.

(٥٥) بێجگە لە خوا هەموتان هەرچی ئەتوانن لە دژایەتیم بیکەنو لەکێ یارمەتی وەر ئەگرن وەری گرن لە پاشدا هیچ ماوەیشم پێ مەدەنو بێ منەت بن.

(٥٦) بێگومان کەمن پشتم بەستوە بەو الله یەی کە پەروەردگاری منەو پەروەردگاری ئێوەشە هیچ شتێك نیە کەبەسەر ئەو زەویەدا بڕوات مەگەر ناوچاوانی بەدەست ئەوزاتەوەبێتو ناتوانێت بەبێ مەیلو ئارەزۆی خوا هیچ شتێك ئەنجام بدات نەچاك نەخراپ، نەسودو نەزیان، بەبێگومان پەروەردگاری من لەسەر رێگایەکی راستەو فەرمانەکانی داد پەروەرانەیەو ستەم لەکەس ناکات، کەواتە ئەو بەرنامەو رێبازەی کە ئەو ناردویەتی رێبازێکی راستەو رەوایەولادان لەورێبازە چەواشەوناڕەوایە.

(٥٧) ئەوسا ئەگەر ئێوە پشت دەکەنە ئەو ئایینەو گوێی پێ نادەن کەیفی خۆتانەوهەرخۆتان رەنجەڕۆدەبن بەحەقیقەت من

قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَءَاتَىٰنِي مِنۡهُ رَحۡمَةٗ فَمَن يَنصُرُنِي مِنَ ٱللَّهِ إِنۡ عَصَيۡتُهُۥۖ فَمَا تَزِيدُونَنِي غَيۡرَ تَخۡسِيرٖ ﴿٦٣﴾ وَيَٰقَوۡمِ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمۡ ءَايَةٗۖ فَذَرُوهَا تَأۡكُلۡ فِيٓ أَرۡضِ ٱللَّهِۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٖ فَيَأۡخُذَكُمۡ عَذَابٞ قَرِيبٞ ﴿٦٤﴾ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُواْ فِي دَارِكُمۡ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٖۖ ذَٰلِكَ وَعۡدٌ غَيۡرُ مَكۡذُوبٖ ﴿٦٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا صَٰلِحٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَمِنۡ خِزۡيِ يَوۡمِئِذٍۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿٦٦﴾ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَاْ كَفَرُواْ رَبَّهُمۡۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ وَلَقَدۡ جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُواْ سَلَٰمٗاۖ قَالَ سَلَٰمٞۖ فَمَا لَبِثَ أَن جَآءَ بِعِجۡلٍ حَنِيذٖ ﴿٦٩﴾ فَلَمَّا رَءَآ أَيۡدِيَهُمۡ لَا تَصِلُ إِلَيۡهِ نَكِرَهُمۡ وَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۚ قَالُواْ لَا تَخَفۡ إِنَّآ أُرۡسِلۡنَآ إِلَىٰ قَوۡمِ لُوطٖ ﴿٧٠﴾ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾

تەبلیغم کردنو ئەوەی کەمنی بۆ رەوانە کرابو پێم راگەیاندن، جا ئەگەر پەیڕەویم دەکەن ئەوە باشە ئەگینا خوا خاوەن دەسەڵاتەو ئێوەش وەك گەلانی پێش خۆتان لە ناو ئەباتو پەروەردگارم گەلێکی تر بێجگە لە ئێوە لە شوێنتان دائەنێتو ئێوە هیچ زیانێك لە خودا نادەن، بەبێگومان پەروەردگارم چاودێرە بەسەر هەمو شتێکدا . ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

﴿٥٨﴾ جا کاتێك کە فەرمانی ئێمە هات بۆ لە ناوبردنیان بە با هودو ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بو لەگەڵ ئەودا بە هۆی سۆزو بەزەیی خۆمانەوە هەمومان رزگار کردنو ئێمە ئەوانمان رزگار کرد لەو سزا قورسو سەختەی کەبێ باوەڕانی وەك داری ریشە رزیوو پتورکاو چەنومل خست.

﴿٥٩﴾ ئەوە گەلی عاد بو کە بێباوەڕبون بە نیشانەکانی پەروەردگاری خۆیانو ئینکاریان ئەکردو سەرپێچیان لە فەرمانی پێغەمبەرەکانیان دەکرد (هەمو پێغەمبەران) ، چونکە دژایەتی کردنی یەك پێغەمبەر دژایەتی هەمو پێغەمبەرانە بۆیە بە کۆی هێناو فەرمویَ: ﴿ رُسُلَهُۥ ﴾ ، وە ئەم گەلە پەیڕەوی کەری هەمو مرۆڤێکی زۆردارو سەرکەش بونو وازیان لە پێغەمبەرەکەیان هێنا لەبەر ئەوە،

﴿٦٠﴾ئەمانە هەر لەم دنیادا بەر نەفرینی خوا کەوتنو لە قیامەتیشدا، ئاگاداربن کە هۆزی عاد بێباوەڕبون بە پەوەردگاری خۆیان، ئاگاداربن دوری لە رەحمەتی خوا بۆ گەلی عاد کە قەومی هودە. پێویستە موسڵمانان ئەوە بزانن کە ئەم داستانانەی قورئان بۆئێمەیە تاپەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرین تا دوچاری ئەو سەرنویشتە خراپەی ئەوان نەبین. ئینجا دەچێتە سەر داستانی سەمود کە گەلی ساڵح پێغەمبەر بوون عليه السلام و دەفەرموێ:

﴿٦١﴾ ئەوسا بۆ گەلی سەمودیش براکەیان کە ساڵح بو بە پێغەمبەرایەتی ناردمانە لایان کە وتی: ئەی گەلی خۆم خودا بپەرستن، چونکە بێجگە لەو هیچ خودایەکی تر نیە کە شایستەی پەرستن بێت ئەو ئێوەی لەم زەویە دروستکردوەو داوای لێ کردون کە ئاوەدانی بکەنەوەو تەمەنتان لەسەر ئەودا تەواو بکەن دەی ئێوەش داوای لێخۆشبونی لێ بکەن لەپاشان بەپەشیمان بونەوە لەتاوان هەر بۆ لای ئەو بگەڕێنەوە، بێگومان پەروەردگارم نزیکە لە هەمو شتێکەوەو وەڵامی هەمو شتێکیش دەداتەوە. واتە بپاڕێنەوە لێیو دڵخۆشبن کە ئەو وەڵامتان ئەداتەوە، بەڵام ئەمانیش وەك گەلەکانی پێش خۆیان دژایەتی ساڵح یان کردو

﴿٦٢﴾وتیان: بەڕاستی ئەی ساڵح تۆ لە پێشەوە لە ناو ئێمەدا بە پیاوێکی ژیر حیساب ئەکرایتو چاوەڕوانی ئەوەت لێ ئەکرا کە پیاو ماقوڵێکی ئەم گەلە بی. وتیان ئەی ساڵح: تۆ ئێمە بەرگری ئەکەیت لە بەندایەتی ئەوەی کە باوباپیرانمان بەندایەتی بۆ کردوە؟! واتە سەرمان سوڕماوە لەوەی کە تۆ ئەوەندە ژیر بویت کەچی وائێستا ئاوات لێ هاتوە کە داوا ئەکەیت لە ئێمە واز لەو رەوشتە بهێنین کە رەوشتی باو باپیرانمان بووە، بێگومان کە ئێمە لە گوماندان سەبارەت بەڕاستی ئەو شتەی کە تۆ ئێمەی بۆ بانگ ئەکەیتو پەیڕەویت ناکەین. بەڵێ خوویەکی هەمیشەیی بێ باوەڕانە بەکۆنو تازەیانەوە هەر کەسێك خودای بەڕاستی ویست بێتو خەڵکی بەرەو چاکە بانگ کردبێت بە نەزانیان داناوە ئەگەر چی لە پێشدا زۆر بە ژیرو دەست پاکیش لەناویاندا ناسراو بێت؟!

﴿٦٣﴾ وتی: ئەی گەلی خۆم پێم بڵێن ئەگەر من لەسەر چاو ڕۆشنیو بەڵگەی ئاشکرا بم لەلایەن پەروەردگاری خۆمەوەو لەلایەن خۆیەوە ئەم سۆزەی پێغەمبەرایەتییەی بەمن بەخشی بێت ، جا کێ یارمەتیم ئەدات ئەگەر هاتو من فەرمانی ﷲ بشکێنمو ئەم پەیامە بشارمەوەو بەئێوەی نەڵێم؟ جامن دڵنیام ئەی گەلی خۆم کە ئێوە ناتوانن هیچ شتێکی زیادەو چاکەم لەگەڵدا بکەن بێجگەلەوەی کە زیاتر گرفتاری زیانم بکەن واتە من لەبەر تانەو تەشەری ئێوە واز لەم بانگەوازە ناهێنم ئەوەی راستەو رەوایە بەبێ پێچو پەناو بەرونی باسی ئەکەم بۆتان جا ئەوە بو ئەو گەلە وتیان: تۆ هیچ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نیە کە

ئێمە باوەڕت پێ بکەین‌و داوای موعجیزەیان کردو وتیان: با لەو بەردە وشترێك بێتە دەرەوە سالحیش ﷺ داوای لە خوا کردو وشترێك لە بەردەکە هاتە دەرەوە ، ئینجا وتی:

(٦٤) ئەی گەلی من ئەمە وشترێکە کە ﷲ وەك موعجیزەیەك بۆ ئێوەی ناردوە، جا وازی لێ بهێنن تا لەم سەر زەوییەی ﷲ دا با بۆخۆی بلەوەڕێت‌و هەرگیز دەستدرێژی نەکەنە سەری چونکە ئەوە موعجیزەیەکەو هەرکە دژایەتیتان کرد سزایەکی گەورەی نزیك دەتان گرێتەوە ،

(٦٥) جا ئەوان گوێیان بەئامۆژگاری سالح ﷺ نەداو وشترەکەیان کوشت، خۆتەنها یەکێکیان کوشتی بەڵام چونکە بەرەزامەندی هەموویان بوە هەموویان تاوانبارن ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلە هەر جێگایەکدا کەسێ یان زیاتر خراپەیەکیان کردو باقی رازی بون هەمو شەریکن لەو تاوانەداو ئەبێ چاوەڕوانی سزای هەردوو ژیان ببن . جا کاتێ کەئەم تاوانەیان ئەنجام دا پێغەمبەرەکەیان لێیان عاجز بو پێی وتن: چی بەچاك ئەزانن بیکەن‌و بۆ خۆتان رابوێرن لەماڵەکانتاندا هەتا سێ رۆژ ماوەتان هەیە لە دوای ئەو سێ رۆژە سزاتان بۆ دێت، ئەوە بەڵێنێکی راستەو هیچ درۆی تێدا نیە. جا ﷲ دەفەرموێ:

(٦٦) جا کاتێ کە فەرمانی ئێمە هات بۆ سزادانیان سالح پێغەمبەرو ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ هێنا بو بەڕاستی‌و لەگەڵیا بون بەسۆزو بەزەیی خۆمان رزگارمان کردن ولاماندان لەسەر شۆڕی ئەو رۆژە، بەبێگومان ئەی محمدﷺ پەروەردگارت هەرخۆیەتی بەدەسەلاتەو بەهێزە. ئینجا جۆنیەتی سزاکەی دنیایان باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٦٧) جا ئەوانەی کە ستەمیان ئەکرد دەنگێکی توند ناڵاندی بەسەریانداو هەموویان لەماڵەکانی خۆیاندا چەن‌ومل کەوتن‌و مردن‌و کارێکی وایان بەسەرداهات کە هیچیان لەو دەنگە رزگاریان نەبو.

(٦٨) وەك ئەوەی کە ئەوان هەرگیز لەو جێگاو ماڵانەدا نەبوبن ئاگادار بن کە سەمود بێ باوەڕبون بە پەروەردگاری خۆیان، ئاگاداربن دووری لەرەحمەتی خوا بۆ سەمود. ئابەم شێوەیە داستانی ساڵ‌ﷺح و گەلەکەی کۆتایی پێ هات. ئەچێتەسەر داستانی گەلی لوت ﷺ بەڵام پێش ئەوەی بچێتە سەرباسی لوت باسی ئیبراهیم‌و مێوانەکانی دەکات چونکە هەر ئەو مێوانانەی ئیبراهیم ﷺ بون کە مەئموری لەناوبردنی گەلی لوتیش بون بۆیە دەفەرموێ:

(٦٩) ئەوسا بەڕاستی نێرراوەکانی ئێمە هاتن بۆلای ئیبراهیم بەموژدەوە چ موژدەی کوڕ پێدانی یان لە ناو بردنی ئەوگەلە ستەمکارەو رزگارکردنی لوت پێغەمبەر ﷺ بێ هەموویان هەر موژدەیەو مایەی دڵخۆشی ئیبراهیمی بت شکێنە ﷺ، جا ئەو مەئمورانە لە شێوەی چەند لاوێکی چالاك‌و جوان هاتنە لای‌و وتیان: سلام علیکم ، ئەویش وتی: سلام علیکم، زۆری پێ نەچو بە هێواشی چوو گوێرەکەیەك(گۆلك) ی برژاوی بۆ هێنا‌و بۆی دانان کە بیخۆن بەڵام ئەوان نەیان خوارد.

(٧٠) جا کاتێك کەدی ئەوان دەستی بۆنابەن ونایخۆن، وەئەو نەیزانی کە ئەوانە مەئموری خودان‌و خواردنیان ناوێ لەبەر ئەوە پێی نارەحەت بو بەچاکی نەزانین، چونکە مێوان ئەگەر خواردنی بۆ دانراو نەیخوارد بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە رەئی چاکی نیە سەبارەت بەو خاوەن ماڵە، لەبەر ئەوە ترسێك هات بە دڵیداو ئەوانیش هەستیان پێ کرد، وتیان: مەترسە ئێمە مەئمورین‌و رەوانە کراوین بۆ سەر گەلی لوت بۆ ئەوەی لە ناویان ببەین، جا لەو کاتەدا ئیبراهیم ﷺدانیشتبو لە ناو میوانەکانیدا.

(٧١) خێزانەکەیشی بەپێوە وەستا بو بۆ خزمەت کردن ئەوسا کاتێ کەئەم قسانەی لە مێوانەکانەوە بیست ترسی نەماو لە خۆشیدا پێکەنی، هەندێك ئەڵێن: ئەو کە تەمەنی لە هەشتا بەرەو سەرتر بو زۆر حەزی لە منداڵ ئەکرد، چونکە منداڵی نەبو، وە ئەوەندە پیرببو کەعادەتی ژنانەی نەمابو لەبەر ئەوە لە منداڵبون نائومێد ببو ئا لەو کاتەدا کەوتە عادەتی ژنانەوە!! جا هەر لەو کاتەداو لە رێگای ئەو فریشتە مەئمورانەوە خوا دەفەرموێ: موژدەمان پێ دا بەکوڕێك کەناوی ئیسحاقە‌و لەو ئیسحاقەیش یەعقووب دەبێ، بەڕاستی ئەمە بۆ ئەو شتێکی دوور بو،

(٧٢) بۆیە بە شێوەیەکی سەرسوڕمانەوە وتی: وای بۆ من ئایا من منداڵم ئەبێ لە حاڵێکدا کەمن پیر بووم وئەمەش مێردەکەمە کە پیاوێکی پیرە؟! بەڕاستی ئەمە شتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە، چۆن ئەبێ باوەڕ بەشتی وابکەم؟ لەبەر ئەوە فریشتەکان زیاتر کەوتنە گفتوگۆ لە گەڵیدا،

(٧٣) وتیان: ئایا تۆ سەرسام ئەبیت لە فەرمانی ﷲ رەحمەت‌و بەرەکەتی خوا لە ئێوە بێت ئەی ئاڵ‌و بەیتی ئەم ماڵە بەنرخە،

قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ فَلَمَّا ذَهَبَ عَنۡ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلرَّوۡعُ وَجَآءَتۡهُ ٱلۡبُشۡرَىٰ يُجَٰدِلُنَا فِي قَوۡمِ لُوطٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ لَحَلِيمٌ أَوَّٰهٞ مُّنِيبٞ ﴿٧٥﴾ يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَآۖ إِنَّهُۥ قَدۡ جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَإِنَّهُمۡ ءَاتِيهِمۡ عَذَابٌ غَيۡرُ مَرۡدُودٖ ﴿٧٦﴾ وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَصِيبٞ ﴿٧٧﴾ وَجَآءَهُۥ قَوۡمُهُۥ يُهۡرَعُونَ إِلَيۡهِ وَمِن قَبۡلُ كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطۡهَرُ لَكُمۡۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُخۡزُونِ فِي ضَيۡفِيٓۖ أَلَيۡسَ مِنكُمۡ رَجُلٞ رَّشِيدٞ ﴿٧٨﴾ قَالُواْ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَا لَنَا فِي بَنَاتِكَ مِنۡ حَقّٖ وَإِنَّكَ لَتَعۡلَمُ مَا نُرِيدُ ﴿٧٩﴾ قَالَ لَوۡ أَنَّ لِي بِكُمۡ قُوَّةً أَوۡ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكۡنٖ شَدِيدٖ ﴿٨٠﴾ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ﴿٨١﴾

بێگومان ئەو ﷲ یە سوپاسکراوە لەهەمو کردارو فەرمودەکانیداو بەڕێزو بەخشندەیە، پێت دوورە کە ئالەم تەمەنەدا ئەو بەخشە گەورەیە بەئێوە ببەخشێت؟ ئەمە بەلگەیە لەسەر ئەوە کە خێزانی مرۆڤ ئالو بەیتی کابرایە کەوابو خاتون عائیشەیش ئالو بەیتی پێغەمبەرمانە ﷺ و بەدەقی قورئانﷲ پاکی کردونەتەوەو قسەی خراپ پێ وتنی دژایەتی دەقی قورئانەو کوفرە، ئا بەم گفتوگۆیە ئیبراهیم عليه السلام دڵیخۆش بوو ئارامی گرت.

﴿٧٤﴾ جا کاتێك کە ئیبراهیم ترسی نەماو زانی کە ئەمانە مەئمورن‌و لەو تەمەنەشدا مژدەی کوڕیشیان پێ دا ، جا کەوتە قسەو گفتوگۆ لەگەڵیانداو ویستی داکۆکی لە گەلی لوت بکات بەڵکو سزایان لەسەرلابات وەك دەفەرموێ: لەبارەی گەلی لوتەوە دەستی بەکێشە کرد هەتا فەرموی: دەی خۆ لوتی تێدایە وتیان: بەڵێ ئەمە ئەزانین کە لوتی تێدایە ئێمە ئەوو پەیرەوانی‌و ئالو بەیتی رزگار ئەکەین بێجگە لە خێزانەکەی، ئینجا ئیبراهیم عليه السلام بێ دەنگ بو خوای گەورەش لەوەسفی دڵسۆزی ئەودا دەفەرموێ:

﴿٧٥﴾ بێگومان کە ئیبراهیم زۆر بەحەوسەڵە بوو زۆر خەفەتی دەخوارد بۆ خەڵك‌و ئاهی بۆ هەڵدەکێشان‌و زۆر دەگەڕایەوە بۆلای خوای خۆی‌و هەمیشە داوای لێخۆشبون‌و تەوبەی دەکرد هەر لەبەر ئەو سۆزە زۆرەی کە هەی بو، بۆیە ئەو کێشەیەی لەگەڵ فریشتەکاندا کرد بەڵام تازە ئەوان فەرمانی لە ناو چونیان لەلایەن پەروەردگارەوە بۆ دەرچووە کەس ناتوانێ رێگای لێ بگرێت ، بۆیە فریشتەکان رویان کردە ئیبراهیم‌و وتیان:

﴿٧٦﴾ ئەی ئیبراهیم تۆ وازبهێنە لەو قسەیەو لەم بارەوە گفتوگۆمان لەگەڵدا مەکە ، بێگومان کە ئەمرۆ بڕیاری پەروەردگاری تۆ دەرچوە بۆ لە ناو بردنیان‌و بێگومان کەسزایەکی نەگەڕاوە دێت بۆ ئەوان‌و ئەبێ تۆڵەی خراپەکارییەکانیان بە چاو ببینن‌و ببن بە پەندو ئامۆژگاری بۆ پاش خۆیان، ئینجا ئەو فریشتە مەئمورانە ئیبراهیمیان بەجێ هێشت‌و بەرەو لای لوت چون، ئەڵێن: لوت لەناو کێڵگەکەی خۆیدا بو یان لە ماڵ بو ئەو کۆمەڵە بەرواڵەت هەمو جوان‌و رێك‌و پێکە مێوانی لوت بون‌و گەلی لوتیش نێرباز بون!! لەبەر ئەوە ترسا لەوەی کە گەلەکەی دەست درێژی بکەنە سەریان بۆیە دەفەرموێ:

﴿٧٧﴾ کاتێك کە نێرراوی ئێمە هات بۆلای لوت زۆر ناڕەحەت بو ئەو رۆژەی بەرۆژێکی خراپ‌و تەنگ زانی، دنیای لێ هاتەوەیەك‌و نەیدەزانی چی بکات‌و وتی: بەراستی ئەمە رۆژێکی زۆر سەختەو بەڵایەکی گەورەیە. ئەمیش وەك ئیبراهیم پێشەکی نەیدەناسین‌و نەیدەزانی فریشتەو مەئمورن‌و بۆ لەناو بردنی گەلەکەی هاتون‌و ئەوان هیچیان پێ ناکرێ بەرامبەری ئەو مەئمورانە، بۆیە ئاوا بەو شێوەیە بەو مێوانانەی غەمناك بو، ئەمەش بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە لەسەر ئەوەی کە هیچ کەسێك غەیب نازانێت بێجگە لە ﷲ ئەوەبو کە ئەو دوو پێغەمبەرە بەرێزە نەیانزانی ئەوانە فریشتەن‌و بەشەرنین تا خۆیان پێیان وتن؟! زۆرجاك ورد ببەرەوەلەم دووروداوانەوکەم بەدوای قسەی پڕوپوچدا بڕۆ وبەسیە خەڵك فریودان بۆ گیرفان پڕکردن دڵنیابە خوا تۆڵەت لێ وەردەگرێت. جا تەماشا بکەن‌و بزانن کە ترسی لوت عليه السلام چەند بەرێ‌وجێ بوە چونکە هەرکە گەلەکەی زانیان بەو مێوانانە،

﴿٧٨﴾ دەس‌ودەم گەلەکەی بەپەلە هاتن بۆلای لوت عليه السلام وئەوان لە پێشەوە ئیشی خراپیان ئەکردو ئێستاش هەر بۆئەو مەبەستە خراپە هاتن بۆ لای مێوانەکانی، بۆیە ئەو زۆر کەوتە بارێکی سەختەوە کە وتی: ئەی گەلی خۆم ئەوە کچەکانی خۆمن وەرن بابیدەم پێتان بە حەڵاڵی، ئەڵێن ئەوان داوای کچەکانیان کرد بو لەپێش ئەم روداوەدا ، بەڵام لوت لەبەر ئەو رەوشتە پیسەیان پێی نەدابون ئێستە کەئاوەها دەیانەوێ دەست درێژی بکەنە سەر مێوانەکانی ویستی بەم شێوەیە کەمێ شەرم بکەن‌و ئازاری مێوانەکانی نەدەن، هەندێ ئەڵێن مەبەستی ئافرەتی گەلەکەی بوە نەك کچی خۆی، واتە: نێر بازی مەکەن ئەوە هەمو

کچەو بەشێوەی حەڵاڵ سودیان لێ وەرگرن کەئەوان پاك و خاوێن ترن بۆتان و هەر ئەوە ڕەوایەو نابێ کاری پیس لەگەڵ پیاواندا ئەنجام بدەن، جا لە خوا بترسن و سەرشۆڕم مەکەن لەبارەی میوانەکانمەوە ئایا لە ناو ئێوەدا پیاوێکی بە غیرەت نیە کە پاڵپشتی من بێت و پارێزگاری ئەم میوانانەم بکات؟ بەڵام ئەو گەلە هیچ غیرەتی پیاوەتیان تێدا نەبو بەڵکوزیاتر سور بون لەسەر ئیشی خۆیان.

﴿٧٩﴾ وتیان: بەڕاستی خۆت دەزانی کە ئێمە لەبارەی کچەکانی تۆدا هیچ مافێکمان نیەو بێگومان تۆ ئەزانیت مەبەستی ئێمە چیەو ئەبێ ئەم میوانانەمان بدەیتە دەست. بەڵێ بەڕاستی ڕۆژێکی زۆر سەخت بو بەسەر ئەو پێغەمبەرەعليه السلام دا هات و

﴿٨٠﴾ وتی: ئەگەر من قوەت و هێزێکم ببوایە ئێستا پەنام بۆ ئەبردو بەرگریم لەم مێوانانەم دەکردو ماوەم بەئێوە نەئەدا بەم شێوەیە بێنە سەر ماڵم و دەست درێژی بکەنە سەر مێوانەکانم، نە، من پەنادەبەم بۆ جێگایەکی زۆربەتوانا. واتە لوت کەوتە سەختترین کات و ویستی ئا بەم قسەیە کەمێ غیرەتی ئەو بێ غیرەتانە بجوڵێنێت چونکە ئەو ئیستا بێ کەس و بێ عەشرەتە لەناو ئەواندا و ئەوان عەرەب بون بەڵام لوت یان کورد یان کلدانی بوە لەسەر قسەی مێژو نوسان ، هەندێ دەڵێن: مەبەست لە ﴿رُكۡنٖ شَدِيدٖ﴾ خزم و عەشرەت و لوت عليه السلام نەیدەزانی پەنا بۆ کوێ ببات، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { **وَرَحْمَةُ اللهِ عَلَى لُوطٍ إِنْ كَانَ لَيَأْوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ آوِي إِلَى رُكْنٍ شَدِيدٍ وَمَا بَعَثَ اللَّهُ مِنْ بَعْدِهِ مِنْ نَبِيٍّ إِلَّا فِي ثَرْوَةٍ مِنْ قَوْمِهِ**/ متفق عليه/ ڕەحمەتی خوا لە لوت بێ بەڕاستی پەنای بردە لای جێگایەکی زۆر بەهێز کە الله جل جلاله بو ئەو کاتەی کە وتی بەگەلەکەی: ئای ئێستا من توانام بەسەرتاندا ببوایە، نە من پەنا ئەبەم بۆلای کەسێکی زۆر بەتوانا. وەپاش ئەوالله هیچ پێغەمبەرێکی ڕەوانە نەکردوە مەگەر لەناو دەسەڵاتدارەکانی گەلەکەی دابو بێت} جا کە میوانەکان کاتێ ئەم هەمو کێشەکێشەی لوت و گەلەکەیان دیء و دیيان کە لوت بێنیهایەت لە سەختی دایە.

﴿٨١﴾ وتیان: ئەی لوت بێگومان کە ئێمە نێرراوی پەروەردگاری تۆین و مەئمورین ئەوان ناتوانن هیچ بەتۆ بکەن ، بەڵکو بە فەرمانیالله ئێمە ئەوان لە ناو ئەبەین، جا تۆ هەر ئەمشەو خۆت و خاوخێزانت لێرە بڕۆن لانەکاتەوە بۆلای ئەو گەلەو نەمێنێتەوە هیچ کەس لە ئێوە بێجگە لە ژنەکەت ئەو لەو کاتەوە دڵی لەگەڵ ئەو گەلەدایە لەبەر ئەوە بەڕاستی ژنەکەت

فَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا جَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهَا حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٖ مَّنضُودٖ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَۖ وَمَا هِيَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٖ ﴿٨٣﴾ ۞ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥۖ وَلَا تَنقُصُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَۖ إِنِّيٓ أَرَىٰكُم بِخَيۡرٖ وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوۡمِ أَوۡفُواْ ٱلۡمِكۡيَالَ وَٱلۡمِيزَانَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا تَبۡخَسُواْ ٱلنَّاسَ أَشۡيَآءَهُمۡ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيۡكُم بِحَفِيظٖ ﴿٨٦﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأۡمُرُكَ أَن نَّتۡرُكَ مَا يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوۡ أَن نَّفۡعَلَ فِيٓ أَمۡوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُاْۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلۡحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾

توشی ئەو بەڵایە دەبێت کە ئەوان توشی دەبن بەبێگومان کاتی لەناو بردنیان بەیانیيە ، ئینجا لوت پەلەی بو ئەیوت: زوتر ئەوانیش وتیان: ئایا بەیانی دوورە؟

﴿٨٢﴾ جا کاتێك کە فەرمانی ئێمە هات بۆلە بەین بردنیان ئێمە سەرو ژێرمان کردن و هەڵمان گەڕاندنەوەو بارانی بەردی لە قوڕ دروستکراومان ڕژان بەسەریاندا بەبارانێکی ڕێك و پێك و یەك بەدوای یەکدا. ئەڵێن جبرەئیل باڵی کرد بەژێر شارەکانیانداو ئەوەندە بەرزی کردنەوە کە خەڵکی ئاسمانی یەکەم گوێیان لە دەنگی سەگو مەڕو ماڵاتیان بو ئینجا قلپی کردنەوە، جا ئەوجێگایەی کەکاتی خۆی بەرزتر بو لەو زەویەداو سەیرانگاو کەیفیان تێدا دەکرد ئەوە پێش شوێنەکانی تر کەوتە زەوی و هەمو لە ناوچون.

﴿٨٣﴾ ئەو بەردانە دیاری کرابون هەر بەردەی لە کەسی تایبەتی خۆی دەدرا، ئینجا خوا دەفەرموێ: وە ئەم جۆرە سزایە بۆ ئەو جۆرە داوێن پیس و ستەمکارانە لە هیچ کاتێکدا دوور نیەو هەر گەلێك ئەو جۆرە تاوانانەی تێدا کراو کەس بەرگری لێ نەکرد ئەبێ چاوەڕوانی سزای ئاوای بۆ بکرێت وەبە یەقینیش هەر ئاوا ئەبێ _خوا پەنامان بدات_ ئینجا دەچێتە سەرداستانی شوعەیب عليه السلام دەفەرموێ:

وَيَٰقَوۡمِ لَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شِقَاقِيٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثۡلُ مَآ أَصَابَ قَوۡمَ نُوحٍ أَوۡ قَوۡمَ هُودٍ أَوۡ قَوۡمَ صَٰلِحٖۚ وَمَا قَوۡمُ لُوطٖ مِّنكُم بِبَعِيدٖ ﴿٨٩﴾ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيۡهِۚ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٞ وَدُودٞ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ يَٰشُعَيۡبُ مَا نَفۡقَهُ كَثِيرٗا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفٗاۖ وَلَوۡلَا رَهۡطُكَ لَرَجَمۡنَٰكَۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡنَا بِعَزِيزٖ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَهۡطِيٓ أَعَزُّ عَلَيۡكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذۡتُمُوهُ وَرَآءَكُمۡ ظِهۡرِيًّاۖ إِنَّ رَبِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوۡمِ ٱعۡمَلُواْ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمۡ إِنِّي عَٰمِلٞۖ سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ مَن يَأۡتِيهِ عَذَابٞ يُخۡزِيهِ وَمَنۡ هُوَ كَٰذِبٞۖ وَٱرۡتَقِبُوٓاْ إِنِّي مَعَكُمۡ رَقِيبٞ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمۡرُنَا نَجَّيۡنَا شُعَيۡبٗا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ بِرَحۡمَةٖ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلصَّيۡحَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دِيَٰرِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمۡ يَغۡنَوۡاْ فِيهَآۗ أَلَا بُعۡدٗا لِّمَدۡيَنَ كَمَا بَعِدَتۡ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٩٦﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱتَّبَعُوٓاْ أَمۡرَ فِرۡعَوۡنَۖ وَمَآ أَمۡرُ فِرۡعَوۡنَ بِرَشِيدٖ ﴿٩٧﴾

(٨٤) وەبۆ مەدیەن كەناوی جێگایەكە (شوعەیب)ی برایانمان بۆ ڕەوانە كردن بۆ ئەوەی ڕێگای ڕاستیان پیشان بداتو لە بت پەرستیو ترازو بازیو خوورەوشتی ناشیرین دوریان بخاتەوەو وتی: ئەی گەلی خۆم بەندایەتی اللّٰه بكەن كە بێجگە لەو هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینەی ترتان نیە. لەڕاستیدا ئەمە قسەی هەموو پێغەمبەران بوە "كە خەڵكی تەنها بەندایەتی خودا بكەن" وە وتی: كاتێك كە شتێك دەفرۆشن بەخەڵك پێوانەو كێشانەتان كەم مەكەن، بێگومان من واتانم دەبینم كە ئێوەوان لە ناو نازو نیعمەتێكی چاكداو بەشی خۆتانتان هەیە، جا خوا لە خۆتان عاجز مەكەن، بێگومان من ئەترسم لێتان ئەگەر ئێوە هەروا بەردەوام بن لەسەر ئەو ئیشانەتان كە دوچاری سزای ڕۆژێك ببن كەكەستانی لێ ڕزگار نەبێ،

(٨٥) دەی ئەی گەلی خۆم با پێوانەو كێشانەتان ڕێكو پێكو دادگەرانە بێو بەچ كێشانەو پێوانەیەك دەكڕن بۆ خۆتان وایش بە خەڵكی بفرۆشن كەلو پەلی خەڵك بێ نرخوسوك مەكەنو زیان مەگەیەنن بەخەڵك و خراپەوبێڕەوشتی لەسەر زەوی دا بڵاو مەكەنەوە.

(٨٦) ئەوەی كە بۆتان دەمێنێتەوە لە مامەڵەیەكی ڕێكو پێكو لە كێشانەیەكی ڕێكو پێكدا ئەوە باشترە بۆتان نەك سەروەتو سامانێكی زۆر بەحەرام كۆبكەنەوە ، چونكە هەرچەندە زۆربێ بێ نرخەو سزای پاشە ڕۆژی هەیە بەڵام بەشێوەی حەڵاڵ چاكەو پاداشی دوا ڕۆژیشی هەیە ئەگەر ئێوە ئیمانداربن، وە من چاودێرو نیگاهبان نیم بەسەر ئێوەداو نەیەڵم كە ئێوە لە كێشانەو پێوانەدا كەمو زیاد بكەن بەڵكو ئەبێ خۆتان بیرو باوەڕی خۆتان چاك بكەنو زیان بەكەلو پەلی خەڵكی نەگەیەنن، من ڕاگەیاندنم لە سەرەو هیچی تر، بەڵام ئەمانیش هەروەكو گەلانی پێش خۆیان دژایەتی پێغەمبەرەكەی خۆیان كردو بەگاڵتەوە وەڵامیان ئەدایەوە.

(٨٧) وتیان ئەی شوعەیب: ئایینو نوێژەكەی تۆ وا دەستورت پێ ئەدات كە ئێمە واز بهێنین لە پەرستنی ئەو شتانەی كە باوباپیرانمان پەرستویانە یان ئەبێ ئێمە لەسەروەت وسامانی خۆماندا بەئارەزۆی خۆمان ئیش نەكەین؟! ئینجا هەر بەشێوەی گاڵتەپێ كردنەوە ئەیان وت: بەڕاستی تۆ ئیسانێكی بەحەوسەڵەو بەفامو تێگەیشتویت چۆن قسەی وائەكەیت؟! ئینجا شوعەیب عليه السلام وەڵامی دانەوە،

(٨٨) وتی: ئەی گەلی خۆم پێم بڵێن ئەگەر من لەسەر چاو ڕۆشنی بم لەلایەن پەروەردگارمەوەو ئەو پێغەمبەرایەتیو ڕزقێكی چاكو پاكی پێدابم، ئیتر بۆ من ئەو زیانە لەو خەڵكە بدەموخۆم توشی سزای خودا بكەم؟ مەبەستی گەلەكەیەتیو بەخۆی ئەڵێت تا بەڵكو ئەوان زیاتر دوور نەكەونەوەو گوێی بۆ بگرنو وتی: من نامەوێ كەبە پێچەوانەی ئێوەوە بجوڵێمەوەو ئێوە بترسێنم لەترازو بازیو خۆم بیكەم كە ئەڵێم خراپە بۆ هەمومان خراپەو من لەم بانگەوازەدا هیچ مەبەستێكم نیە بێجگە لەریكو پێك كردنی ژیانو كارو بارتان تا ئەو جێگایەی كە توانام هەیەو هیوام خێرو خۆشی ئێوەیەو ئەنجامدانی فەرمانی اللّٰه، وە هیچ كەسێك نیە كە یارمەتیم بدات بێجگە لە اللّٰه كە تەنها بەو پشت دەبەستمو تەنها بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە.

(٨٩) جا وتی ئەی گەلی خۆم: با دژایەتیو دوریتان لەمن واتان لێ نەكات كە دوچاری وێنەی ئەو سزایانە ببن كە دوچاری گەلی نوحو یان گەلی هود یان گەلی ساڵح بوە خۆگەلی لوتیش دورنیە لێتانەوە ، بەڕاستی هەم لەڕوی زەمانیشەوە هەم لەڕوی مەكانیشەوە نزیكە لێتان ئێوە حەق وایە باش بیر بكەنەوە.

(٩٠) جا داوای لێخۆشبون لە پەروەدگاری خۆتان بكەن پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای خۆی بێگومان پەروەردگارم زۆر بەسۆزو میهرەبانە. بەداخەوە ئەم مرۆڤە بەدرێژای مێژو كەمێكی زۆر كەمی نەبێ پەندو ئامۆژگاری وەرنەگرتوە لە ڕوداوەكانی پێش خۆیو هەرچی هاتوە خەڵكی پێش خۆی بەهەڵە زانیوە كەچی

خۆیشی هەمان هەڵەی دووبارە کردوەتەوە؟! ئەم گەلەی شوعەیبیش ﷺ گوێیان نەدایە ئامۆژگاریەکانو ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دژایەتیان ئەکردو زیاتر بەسوکی تەماشای ئەو پێغەمبەرەیان دەکرد.

(٩١) وتیان ئەی شوعەیب: بەڕاستی ئێمە لە زۆربەی ئەو قسانەی کە تۆ دەیکەیت تێ ناگەین، قسەکانی تۆمان زۆر بەلاوە گرنگ نیەو بێگومان تۆ لەناو ئێمەدا مرۆڤێکی لاوازو کەم دەستیتو ئەگەر لەبەر ئەو کۆمەڵە نەبێت کە دوات کەوتوون بەڕاستی بەرد بارانیشت دەکەینو تۆ هیچ هێزو دەسەلاتێکت بەسەر ئێمەدا نیە.

(٩٢) شوعەیب وتی: ئەی گەلی خۆم ئایا کۆمەڵەکەی من بەهێزترە لەلای ئێوە لەو خوایەی کە وازتان لێ هێناوەو فەرمانی ئەوتان پشتگوێ خستوە؟ بێگومان پەروەردگارم ئاگاداری کردارەکانی ئێوەیەو هیچ شتێکتان لەزانیاری خوا دەرناچێتو بەم زوانە تۆڵەی کردارەکانتان دەچەژن، ئینجا بەتوندی هەڕەشەیان لێ دەکاتو ئەڵێ:

(٩٣) ئەی گەلی من ئێوە ئیشی خۆتان لەسەر ڕەوشتو باوی خۆتان چۆن ئەزانن چاکە درێژەی پێ بدەنو کاری خۆتان بکەن منیش ئیشی خۆم دەکەمو ڕاستی ودروستی ئەم ڕێبازە بۆ ئێوە ڕونتر دەکەمەوە جا ئەگەر هەروا درێژە بە خراپەکاریو بێگوێیی بدەن لەمەولا دەزانن بۆ کێ سزایەکی سەرشۆڕکەرانە دێتو ئەزانن کە کێ درۆی کردوە؟جا ئێوە چاوەڕێی بکەن بێگومان منیش لەگەڵ ئێوەدا چاوەڕێ دەبم، ئەمە مانای ئازاد کردنیان نییە بەڵکو توند ترین هەڕەشەیە لێیان. بەڵێ ئەم گەلەش نە بە قسەی پێغەمبەرەکەیان کردو نەئامۆژگاریان لە گەلانی پێش خۆیان وەرگرت ، جا بۆیە ئەوانیش بەر سزاو نەفرینی خودا کەوتن وەك دەفەرموێ:

(٩٤) خۆ لە کاتێکدا کە فەرمانی ئێمە هات بۆ سزادانیان شوعەیبو ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ هێنا بوو لەگەڵیدا بون بەسۆزو بەزەیی خۆمان ڕزگارمان کردنو یەك دەنگی توند ئەو کەسانەی کە ستەمکاربون هەژاندو هەمویان لەناو ماڵەکانیاندا چەنو مل کەوتنو مردن.

(٩٥) وەك ئەوەی کەئەو گوندانەیان هەرگیز یەك کەس لەوانی تێدا نەبوبێت جا وترا ئاگاداربن نەفرینو دووری بۆ خەلکی مەدیەن هەروەکو سەمود کەدوورکەوتەوە لە ڕەحمەتو سۆزی خودا. بەڵێ ئەم دوو گەلە نزیك بون لەیەكو عەرەب بون شێوەی کارو سزایان لە یەك ئەچێتو هەردوو بەر نەفرینی خودا

يَقۡدُمُ قَوۡمَهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَأَوۡرَدَهُمُ ٱلنَّارَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡوِرۡدُ ٱلۡمَوۡرُودُ ﴿٩٨﴾ وَأُتۡبِعُواْ فِي هَٰذِهِۦ لَعۡنَةٗ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ بِئۡسَ ٱلرِّفۡدُ ٱلۡمَرۡفُودُ ﴿٩٩﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيۡكَۖ مِنۡهَا قَآئِمٞ وَحَصِيدٞ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡۖ فَمَآ أَغۡنَتۡ عَنۡهُمۡ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِي يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖ لَّمَّا جَآءَ أَمۡرُ رَبِّكَۖ وَمَا زَادُوهُمۡ غَيۡرَ تَتۡبِيبٖ ﴿١٠١﴾ وَكَذَٰلِكَ أَخۡذُ رَبِّكَ إِذَآ أَخَذَ ٱلۡقُرَىٰ وَهِيَ ظَٰلِمَةٌۚ إِنَّ أَخۡذَهُۥٓ أَلِيمٞ شَدِيدٌ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّمَنۡ خَافَ عَذَابَ ٱلۡأٓخِرَةِۚ ذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّجۡمُوعٞ لَّهُ ٱلنَّاسُ وَذَٰلِكَ يَوۡمٞ مَّشۡهُودٞ ﴿١٠٣﴾ وَمَا نُؤَخِّرُهُۥٓ إِلَّا لِأَجَلٖ مَّعۡدُودٖ ﴿١٠٤﴾ يَوۡمَ يَأۡتِ لَا تَكَلَّمُ نَفۡسٌ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ فَمِنۡهُمۡ شَقِيّٞ وَسَعِيدٞ ﴿١٠٥﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ شَقُواْ فَفِي ٱلنَّارِ لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَشَهِيقٌ ﴿١٠٦﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۚ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٠٧﴾ ۞ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ سُعِدُواْ فَفِي ٱلۡجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا مَا دَامَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ إِلَّا مَا شَآءَ رَبُّكَۖ عَطَآءً غَيۡرَ مَجۡذُوذٖ ﴿١٠٨﴾

کەوتن. ئینجادەچێتە سەر داستانی موسا ﷺو گەلەکەیو فیرعەون وپەیڕەوانیو بەشێوەیەکی زۆر کورت سەرەتاوکۆتایی فیرعەون باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٩٦) جا بەڕاستی ئێمە موسامان ڕەوانەکرد بە نیشانەکانی خۆمانەوەو بە هێزێکی زۆر ئاشکراو ڕونەوە، ئەوەبو عەساکەی ئەبو بەمارو دەستی لەژێر باڵی دەرئەهێنا زۆر سپیو ڕوناك ئەبو، بەڵێ خوای زاناو خاوەن دەسلات موسای بەو نیشانانەوە نارد،

(٩٧) بۆلای فیرعەونو پیاو ماقوڵانی ئەوسا ئەوانیش دژایەتی موسایان کردو پەیڕەوی فەرمانەکانی فیرعەونیان کرد ، جا خوا دەفەرموێ: بەڕاستی کاروباری فیرعەون کارو بارێکی فامیدەو ژیرانە نەبو، جا بو بەهۆی سەرلێ شێواوی پەیڕەوانی لەم دنیادا،

(٩٨) لە ڕۆژی قیامەتیشدا پێش گەلەکەی دەکەوێت بۆ سزای دۆزەخو ئەیانباتە ناو ئاگرەوەو بەڕاستی ئەوە پیسترین شوێنێکە کە ئەوان دەچنە ناویەوە.

(٩٩) ئەوسا لەم دنیایەدا نەفرینیان لێ کراوە، هەروەها لەڕۆژی قیامەتیشدا بەڵێ بە نەفرین مێوانداری کران بەڕاستی ئەوە خراپترین مێوانداریە کە ئەوان میوانداریان پێکراوەو خراپترین بەخششو خەلات بو کە بەوان درا. بەم شێوە کورتە باسی موسا

پێغەمبەر ﷺ کۆتای پێ هاتو جێگای بەخششەکانی فیرعەون و پەیڕەوانی زانرا، لەپاشان الله زانا دەفەرموێ:

(١٠٠) ئەوەی کە باسمان کرد هەواڵی گەلانی ئەو وڵاتانە بو کە ئێمە بەسەریاندا دەچینەوەو وەك خۆیان دەیانگێڕینەوە بۆ تۆ ئەی محمد ﷺ جا لەوانە هەندێکیان شوێنەواریان ماوەو لەبەر چاوتانەو هەندێکیشیان نەماوە.

(١٠١) خۆ ئێمە ستەممان لێ نەکردن بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لەنەفسی خۆیان کرد، ئەوسا ئەو خودایانەی کە ئەوان بێجگە لە الله ئەیان پەرستن هیچ سودێکیان بەوان نەگەیاندو نەیانتوانی هیچیان بۆ بکەن لەو کاتەدا کە فەرمانی پەروەردگارت دەرچوبێ بۆ لەناوبردنیان، خۆ ئەوان بێجگە لەناوچون و رەنجەڕۆبون هیچ شتێکی زیاتریان نەدی لە خوداکانیانەوە.

(١٠٢) ئەوسا هەر ئاوایە گرتن و تۆڵەی پەروەردگارت هەرکاتێ خەڵکی وڵاتان بگرێت لەحاڵێکدا کەئەو وڵاتانەو خەڵکەکەیان ستەمکاربن هەر ئاوا خوا بەتوندی تۆڵە لە ستەمکاران وەرئەگرێت و کەس پەنایان نادات ، بێگومان تۆڵەی ئەو بۆ ئەو کەسانەی کە ستەم ئەکەن زۆر زۆر دەردناك و بەهێزە ، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: { إن الله لَيُملي لِلظالم حَتى إذَا أخَذَهُ لَمْ يُفلِتْهُ قالَ ثم قَرَأَ ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ ..الاية ﴾ /البخاري/

بەڕاستی خودا ماوە بەستەمکار ئەدات تا بەکەیفی خۆی چی ئەتوانێ بیکات تا ئەوکاتەی کە ماوەی تەواودەبێت ، جا ئەو کاتە کەگرتی بەرەڵای ناکات. لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ وَكَذَٰلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ ..الاية ﴾ سەیرە هەمیشە ستەمکاران بە ماوەو تەمەن درێژیو هێزی خۆیان دەسخەڕە ئەبن، دڵنیابن کە خوا ماوەی پێ داون تا تاوانی زۆر تربکەن نەك لەبیری چوبن چونکە سەرئەنجام لەدەستی دەرناچن و ئەیانگرێت و تۆڵەیان لێ وەر ئەگرێت، ئینجا لێرە پەنجە بۆ ئەو مەبەستە درێژ کراوەو دەفەرموێ:

(١٠٣) بەڕاستی ئالەمەدا کە باسکرا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ ئەوکەسەی کە بترسێت لەسزای ڕۆژی دوای ئائەو ڕۆژەی کە هەمو خەڵك تێیدا کۆ دەبێتەوە، ئەوە ڕۆژێکە هەمو کەسێکی بۆ ئامادە ئەکرێت وهیچ کەس ون ناکرێت.

(١٠٤) ئەوسا بە دوای ناخەین مەگەر بۆ کاتێکی ژمێرراو دیاریکراو.

(١٠٥) ئەو ڕۆژە کەهات هیچکەس ناتوانێ قسە بکات مەگەر بە ئیزنی خودا تا ئەو ماوە بەو خەڵکە نەدات کەس ناتوانێ هیچ قسەیەك نەچاك و نە خراپ بکات بەڵام کاتێ ماوەدران بازاڕی قسەو جنێودان ونەفرین لەیەك کردن بێنیهایەت گەرم ئەبێ وەکو لە شوێنەکانی تری قورئاندا باسکراوە ، جا ئەو ڕۆژە خەڵکی دوو بەشە هەندێکیان چارە ڕەش و بەدبەختن و هەندێکی تریان سەربەرزو خۆشبەخت.

(١٠٦) جا ئەوانەی چارە ڕەش و بەدبەختن وان لە نێو ئاگرداکە بۆ ئەوان هەیە لەنێو ئەو ئاگرەدا هەناسەدانی درێژو هەناسە وەرگرتن، واتە: تەنها هەناسەی سارد هەڵکێشان و پەنگ خواردنەوەو هەناسەدانی پڕداخ وخەفەت نەبێ لەو ڕۆژەدا هیچی تریان پێ ناکرێت،

(١٠٧) ئەمێننەوە لەنێو ئەو ئاگرەدا بەئەندازەی درێژای تەمەنی ئاسمانان وزەوی مەگەر خوای تۆ ئارەزۆ بکات بۆ دەرهێنانی هەندێکیان چونکە کەس ناتوانێ ڕێگای ویستی الله بگرێت و هەرچی ئارەزۆ بکات دەیکات، ئەنەسی کوڕی مالك دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {لَيُصِيبَن أقْوَامًا سَفْعٌ مِنْ النار بِذُنوبٍ أَصَابُوهَا عُقُوبَةً ثم يُدْخِلُهُمْ اللهُ الجَنةَ بِفَضْلِ رَحْمَتِهِ يُقالُ لَهُمْ الجَهَنميُونَ. /البخاري/ هەندێ خەڵك هەن کە گەرمایی ئاگر هەڵیان دەپرووزێنێت لە تۆڵەی ئەو گوناهانەی کە کردویانە پاشان خودا بەگەورەیی و سۆزی خۆی دەیانخاتە بەهەشتەوە جا پێیان دەوترێ جهەننەمیەکان} وەبۆ چاکان دەفەرموێ:

(١٠٨) جا ئەوانەی کە خۆشبەختن بەدڵنیاییەوە لە ناو بەهەشتدان بۆ هەمیشەو لەوێدا دەمێننەوە بەئەندازەی درێژای تەمەنی ئاسمانان وزەوی مەگەر خوای تۆ ئارەزۆی زیاتریان بۆ بکات کە ئەمە بەخششێکی هەرگیز نەبڕاوەیە بۆ ئەو خۆشبەختانە.

عومەری کوڕی خەتاب دەڵێ: کاتێك کە ئایەتی ﴿فَمِنْهُمْ شَقِيٌّ وَسَعِيدٌ ﴿١٠٥﴾﴾ دابەزی پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە ئایا ئێمە ئیش بکەین لە شتێکدا کە تەواو بوەو یان لە شتێکدا کە لەمەولا دەبێت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {بَلْ عَلَى شَيْءٍ قَدْ فُرِغَ مِنْهُ وَجَرَتْ بِهِ الأقْلامُ يَا عُمَرُ وَلَكِنْ كُل مُيسرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ/ الترمذي، صحح الالبا / بەڵکو ئیش ئەکەین لەسەر شتێك کە تەواوکراوەو قەڵەمەکان ئیشیان تێداکردوە ئەی عومەر، بەڵام هەموکەس ئامادە کراوەبۆ ئەوەی کەبۆی دروستکراوە. ئینجا خوای زاناو کار بەجێ ئەو پەرستراوانەو پەیڕەوانیان باس دەکات و دەفەرموێ:

(١٠٩) جا تۆ نەکەویتە گومانەوە سەبارەت بەپوچی پەرستراوەکانیان چونکە ئەوانە هەر هەمان شت ئەپەرستن کە

باوك وباپیرانیان لەپێش ئەوانەوە بەندایەتیان بۆ كردووە پەرستویانن، ئەمانیش هەروەكو ئەوان نەزانو نەفامن وبەم زوانە بە سزای كردارەكانی خۆیان ئەگەن، جا ئەگەر ئەوان كردارێكی چاكیشیان هەبێ ئێمە خاوەن بەزەیین وهەرلە دنیادا پاداشتی ئەو كردارە چاكانەیان ئەدەینەوەو ئیتر لە رۆژی دوایدا هیچ پاداشتێكیان نیە وەك دەفەرموێ: ئەوسا بەڕاستی ئێمە بەتەواوی‌و بێ كەم‌و كوڕی بەشی خۆیان پێ ئەدەین چ پاداشی چاكەیان لە دنیاداو چ تۆڵەی خراپەیان لە رۆژی قیامەتدا. جا واجارێكی تر پەنجە بۆلای گەلی موسا ئەكێشێتەوەو دەفەرموێ:

(١١٠) خۆ بەڕاستی ئێمە پەڕاومان دا بە موسا كە تەورات بو كەچی ئەوان كەوتنە ناكۆكییەوە لەو پەڕاوەدا، خۆ ئەگەر وشەی پەروەردگارت پێش نەكەوتایە لەسەر ئەوەی كەماوەی لە ناو چونی هەرگەلێك دیاری كراوەو تا ئەوماوەیە دوایی نەیەت هەر ئەبێ بمێنن ئێمە حوكممان دەكرد لە بەینیان داو كتوپڕ تۆڵەمان لێ وەر ئەگرتن، وەبێگومان ئەوان لە گوماندان لەبارەی ئەو پەڕاوو ئایینەی موساوەو بەراستی نازانن.

(١١١) ئەوسا بەبێگومان هیچكام لەوانە نیە مەگەر پەروەردگارت پاداش یان تۆڵەی كردارەكانیان بەرێك‌و پێكی پێ ئەداتەوەو هیچ شتێكیان لەلای الله ون نابێ ، چونكە بێگومان ئەو زۆر ئاگادارە بەو كردارانەی كە ئەیكەن چاك یان خراپ ئاشكرابێ یا پەنهان، واتە ئەی محمد ﷺ تۆ غەمگین‌و عاجز مەبە لەوەی كە ئەوگەلەی تۆ دژایەتی‌و نافەرمانی خوا ئەكەن‌و سزایان زوو پێ ناگات بەڵكو بۆ هەرگەلێك‌و بۆ هەركەسێك ماوەیەكی دیاری كراوی هەیە لەلای خودا تا ئەوماوەیە تەواو نەكات ئەبێ بمێنێ هەرچەندە سەرگەرمی تاوان‌و خراپە بێ.

(١١٢) جا كەوابو خۆبگرەو دەوامت هەبێت لە سەر ئەو بڕیارانەی كەبۆت دێت‌و وەك چۆن دەستورت بەسەردا دراوە بێ كەم‌و زیاد خۆت‌و ئەوانەی كە تەوبەیان كردوە لەگەڵ تۆدا ئەنجامیان بدەن‌و لەخۆ بایی مەبن‌و لە سنور دەرمەچن بەبێگومان ئەوزاتە بینەری ئەوشتانەیە كە ئەیكەن لەسەر چاكەكان پاداشتان هەیەو لەسەر خراپەكانیش سزا. ئینجا الله ئەوەندە توڕەیە لە ستەمكاران بە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:

(١١٣) ئەی محمد ﷺ مەیلی دڵ نەكەن‌و بەدڵ ستەمكارانتان خۆش نەوێ چونكە بەڕاستی ئەگەر ئەوئیشە بكەن ئاگری جەهەننەم ئەتان سووتێنێ.

وشەی (ركن)مەیلی دڵە. لێرەدا دووشت وەرئەگرین:

فَلَا تَكُ فِي مِرْيَةٍ مِّمَّا يَعْبُدُ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ مَا يَعْبُدُونَ إِلَّا كَمَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُهُم مِّن قَبْلُ ۚ وَإِنَّا لَمُوَفُّوهُمْ نَصِيبَهُمْ غَيْرَ مَنقُوصٍ ﴿١٠٩﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۚ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿١١٠﴾ وَإِنَّ كُلًّا لَّمَّا لَيُوَفِّيَنَّهُمْ رَبُّكَ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا يَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١١﴾ فَٱسْتَقِمْ كَمَآ أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا۟ ۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١٢﴾ وَلَا تَرْكَنُوٓا۟ إِلَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ فَتَمَسَّكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِنْ أَوْلِيَآءَ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿١١٣﴾ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ ﴿١١٤﴾ وَٱصْبِرْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١١٥﴾ فَلَوْلَا كَانَ مِنَ ٱلْقُرُونِ مِن قَبْلِكُمْ أُو۟لُوا۟ بَقِيَّةٍ يَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْفَسَادِ فِى ٱلْأَرْضِ إِلَّا قَلِيلًا مِّمَّنْ أَنجَيْنَا مِنْهُمْ ۗ وَٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَآ أُتْرِفُوا۟ فِيهِ وَكَانُوا۟ مُجْرِمِينَ ﴿١١٦﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ ﴿١١٧﴾

**یەكەم** ـ باكابرا خۆیشی لەگەڵ ستەمكارو تاوانباردا نەبێت مادام ئەوانی خۆشویست لەگەڵ ئەواندا بڕیاری سزای بۆ ئەدرێت .

**دووهەم** ـ ئەگەر كابرا بە ناچاری لەگەڵ ستەمكاران‌و تاوانباراندا تێكەڵاو بو بەڵام خۆی تاوان‌و ستەمی نەئەكردو ئەوانیشی بەدڵ خۆش نەئەویست لەگەڵ ئەواندا حیساب ناكرێ، جا بەئەوانەی كەبە ناچاری نیەو بەدڵ لەگەڵ ستەمكاراندان دەفەرموێ: حەتمەن سزا ئەدرێن وبێجگە لە الله یارمەتی دەرو دۆستێكتان نیە لەپاشان یارمەتی نادرێن‌و هەرچیش بكەن سەركەوتو نابن.

(١١٤) ئەوسا لەهەردووسەری رۆژەوە نوێژبكەن كەنوێژەكانی بەیانی‌و نیوەڕۆو عەسرە، وەبەشێك لە شەویش كە نوێژی مەغریب‌و عیشایە. ئەم ئایەتە داوای ئەنجامدانی پێنج فەرزەكان ئەكات‌و پەنجە بۆلای كاتەكانیان رائەكێشێت كە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ لە فەرمودەكانیدا بەتەواوی ئەو پێنج كاتەی رونكردوەتەوە، جا موسڵمانان داوایان لێ كراوە كە ئەو پێنج فەرزە ئەنجام بدەن ، چونكە ئەمانە بەندایەتیەكی زۆر پایە بەرزو بەنرخن‌و بەشێكی گرنگن لە ناوئیشە چاكەكاندا، بێگومان كە چاكەكان خراپەكان لائەبەن. ئەگەر هاتو چاكەتان كرد خراپەكانتان ئەشۆرێتەوەو لای ئەبات، جا وتراوە هۆی دابەزاندنی ئەم ئایەتە ئەوەبو كە پیاوێك ئافرەتێكی ماچ كردو هاتەوەتە خزمەت پێغەمبەرﷺو ئەم هەواڵەی پێ داو رێگای پاك بونەوە لەو تاوانەی داواكرد خوایش ئەم ئایەتەی دابەزاندوە جا

وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ رَبُّكَ ۚ وَلِذَٰلِكَ خَلَقَهُمْ ۗ وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١١٩﴾ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِۦ فُؤَادَكَ ۚ وَجَآءَكَ فِي هَٰذِهِ ٱلْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَىٰ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٢٠﴾ وَقُل لِّلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنَّا عَٰمِلُونَ ﴿١٢١﴾ وَٱنتَظِرُوٓا۟ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ﴿١٢٢﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ يُرْجَعُ ٱلْأَمْرُ كُلُّهُۥ فَٱعْبُدْهُ وَتَوَكَّلْ عَلَيْهِ ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿١٢٣﴾

## سُورَةُ يُوسُفَ ١٢ — ١١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢﴾ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ إِذْ قَالَ يُوسُفُ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَٰجِدِينَ ﴿٤﴾

کابرا وتی: ئەمە هەر بۆ منە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ فەرموی: {لَكَ وَلِمَن عَمِلَ بِهَا مِن أُمَّتِي / الترمذي، صححه الالبا / بۆ تۆیەو بۆ هەرکەسێکە کە ئیشی پێ بکات لە ئوممەتەکەم}

واتە: بڕیارێکی گشتیەو هەرکەس تاوان بکات بەڵام پەشیمان ببێتەوەو چاکە بکات خوا تاوانەکانی بۆ ئەسڕێتەوە. ئینجا خوا دەفەرموێ: ئائەوەی کەباسکرا ئامۆژگاریە بۆ ئەوکەسانەی کەیادی خوا دەکەن وەلە بیری ڕەزامەندی ئەودان.

﴿١١٥﴾ جا خۆبگرە لە سەر بەندایەتیو دورکەوتنەوە لە تاوان، خۆگرتن لەسەر سێ شتە:

یەکەم ـ خۆگرتن لەسەر بەندایەتی خوا.

دووهەم ـ خۆگرتن لەسەر نەکردنی تاوان.

سێهەم: خۆگرتن لەسەر تەنگوچەڵەمەکانی ژیان، جا فەرموی: خۆبگرن چونکە بێگوما کە ﷲ پاداشی چاکەکاران زایەناکات. ئینجا خوای زاناو دانا هەڕەشەئەکاتو دەفەرموێ:

﴿١١٦﴾ ئای ببوایە لەنێو گەلانی پێش ئێوەدا خاوەن ژیریو عەقڵ کەئەوان لەنێو گەلەکەی خۆیاندا مەردانە ڕاپەڕینایەو بەرگریان بکردایە لە خراپەو تاوان واتە نەبون مەگەر کۆمەڵێکی کەم لەئەوانەی کە ڕزگارمان کردن وەك ئەوانەی کەباسمان کردن لەباسی پێغەمبەراندا علیهم السلام، وەئەو کەسانەی کە ستەمکار بون دەستیان دایە تاوانو خراپەکاری بەهۆی ئەو نازو نیعمەتانەی کە تێیدا بونو خوایان لە بیر چویەوەو ترسی دوا ڕۆژیان نەبو. وە ئەوانە تاوانبار بون چونکە لەیاساکانی خوا لایان داو دژایەتی بەرنامەی خوایان کردو خوایش لەناوی بردن.

﴿١١٧﴾ خۆ پەروەردگارت هیچ وڵاتێکی لەناو نەبردوە بەناڕەواو خەڵکەکەی چاکەکارو سالْح بێ .

﴿١١٨﴾ جا ئەگەر پەروەردگارت ئارەزۆی لێ بوایە خەڵکی ئەکرد بەیەك ئایینو بەیەك بەرنامەو کەس دژایەتی ئایینی خودای نەئەکرد بەڵام خوا ئەوە ناکات چونکە خوا بڕیاری داوە کەئەم دنیایە بۆ تاقی کردنەوە بێت، هەر کەس ئارەزۆی لەمشت خۆیدابێ تا بەکەیفی خۆی چاك یان خراپە هەڵبژێرێت، وەهەمیشە ئەوان ناڕێکنو یەك بەرنامەو ڕێباز ناگرن بەڵکو هەندێ خودا ئەپەرستێتو هەندێکی تر مرۆڤو شتانی تر ئەپەرستن کەئەم شتانەیش دنكو دوان نین بەڵکو سەدانو هەزاران جۆریان هەیە

﴿١١٩﴾ بەڵام ئەو کەسانەی کە پەروەردگارت ڕەحمی پێکردون یەك بەرنامەویەك ڕێبازیان هەیەو یەکن ئەگەر چی بەلەشو وڵاتیش لەیەك دوربن، وەهەربۆ ئەوەش دروستکراون، واتە: چونکە مرۆڤ هەرگیز ئیشو کاریان وەکو یەك نیەو هەندێکی کاری دۆزەخی ئەکاتو هەندێکی کاری بەهەشتی ، دۆزەخو بەهەشتیش چەندین جێگای جیاجیایان هەیەو هەرکەسێك ئیشەکەی بەگوێرەی جێگایەکە لەو جێگازۆرانەی بەهەشتو دۆزەخ جا ئەگەر خوا مرۆڤی دروست نەکردایەو بەگوێرەی زانیاری خۆی هەرکەسێکی بخستایە جێگای خۆی مەگەر بەدەگمەن ئەگینا هیچ کەس بەبەشی خۆی ڕازی نەدەبو بەتایبەت دۆزەخیان کە ئەو کاتە ڕەخنەیان لە خودا دەگرتو ئەیان وت: ئەگەر ئێمەت بخستایە دنیاوە ئیشی خراپمان نەدەکردو هەوڵمان ئەدا کام پلەی بەهەشت بەرزترە بەدەستمان بهێنایە، لەبەر ئەوە خودا دروستی کردن وەك لە سورەتی مولکدا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٢﴾﴾ مردنو ژیانی دروستکردوە تا تاقیتان بکاتەوە بزانن کامتان کرداری چاکتر ئەکەن۞.

ئینجا دەفەرموێ: خۆ فەرمانوبڕیاری پەروەردگارت تەواوبوو هاتەدی کە فەرمویەتی: بەڕاستی جەهەننەم پڕ ئەکەم لە جنۆکەو لە ئینسان بەتێکڕا،

هەرلەم بارەوە لە فەرمودەیەکدا کە ئەبو هورەیرە ئەیگێڕێتەوە هاتوە کەئەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {تَحَاجتْ الْجَنةُ وَالنارُ فَقَالتْ النارُ أُوثِرْتُ بِالْمُتَكَبرِينَ وَالْمُتَجَبرِينَ وَقَالتْ الْجَنةُ مَا لِي لَا

يَدْخُلُنِي إلا ضُعَفَاءُ الناسِ وَسَقَطُهُمْ قَالَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى لِلْجَنةِ أَنتِ رَحْمَتِي أَرْحَمُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي وَقَالَ لِلنارِ إنمَا أَنتِ عَذَابِي أُعَذبُ بِكِ مَنْ أَشَاءُ مِنْ عِبَادِي وَلِكُل وَاحِدَةٍ مِنْهُمَا مِلْؤُهَا فَأَما النارُ فَلَا تَمْتَلِئُ حَتى يَضَعَ رِجْلَهُ تَقُولُ قَطْ قَطْ فَهُنَالِكَ تَمْتَلِئُ وَيُزْوَى بَعْضُهَا إِلَى بَعْضٍ وَلَا يَظْلِمُ اللهُ عَز وَجَل مِنْ خَلْقِهِ أَحَدًا وَأَما الْجَنةُ فَإِن اللهَ عَز وَجَل يُنْشِئُ لَهَا خَلْقًا/رواه الشيخان/ بەهەشتو دۆزەخ بوبە كێشەیان دۆزەخ وتی: من زیاتر بەهەرمەند كراوم وبە لوت بەرزو دەسەڵات دارانەوە واتە ئەوانە دێنە نێومنو بەهەشتیش وتی نازانم بۆ بەشی من هەر مرۆڤە لاوازو بێ دەسو بێ كەسەكانە؟. ئینجا خوای بە دەسەڵاتو خاوەن شكۆ بە بەهەشتی فەرمو: تۆ بەزەیی‌و سۆزی منی لەرێگای تۆوە سۆزی خۆم ئەدەم بەو كەسەی كە ئارەزۆم لێ بێ، وە بەئاگری فەرمو: تۆ سزای منی بەهۆی تۆوە تۆڵە ئەسێنم لەو كەسەی كە ئارەزۆم لێ بێ وەهەردووكتان پڕئەبنەوە . بەڵام ئاگر هەرچی ئەخرێتە ناویەوە هەرئەڵێ ماوە زیاتر بابێت تا كەسی جەهەننەمی نامێنێ‌و ئەو هەرداوای زیاتر دەكات تا خوای بەدەسڵات پێی خۆی لەسەر دۆزەخ دا دەنێ، ئینجا دۆزەخ ئەڵێ بەسە بەسەو هەندێكی دەتەپێت بەسەر هەندێكیدا ئەوسا پڕ دەبێتەوە ﷻ ی بەدەسەڵاتو بەشكۆ ستەم لەهیچ دروست كراوێكی خۆی ناكات. جا پاش چونی هەمو بەهەشتیان بۆناو بەهەشت هێشتا بەهەشت جێگای چۆڵی زۆری ئەمێنێ‌و خوا خەڵكێكی تری بۆ دروست ئەكاتو لەو زیادەی بەهەشتدا نیشتەجێ دەبن.

(١٢٠) جا ئەو هەمو هەواڵانەی كە باسی ئەكەین بۆ تۆ لەبارەی پێغەمبەرانو گەلانی پێشوو شێوەی سزاو سەر ئەنجامی هەمویانە، وە بۆئەوەیە كە ئێمە دڵی تۆ بەهێزو بتەوتر بكەین تا زیاتر خۆ راگرو ئارام تربی ئەی محمد ﷺ ولەم سورەتەدا وەك باقی سورەتەكانی تر حەق وراستیت پێگەیشتو بەهۆی ئەو داستانانەوە ئەبێ تۆ زیاتر سور بی لەسەر بانگەوازەكەت و ئەم روداوانە پەندو ئامۆژگاری‌و وبیر خستنەوەیە بۆ باوەڕداران تا بەڵكو بیر لەسەر ئەنجامی ستەمكاران بكەنەوەو زیاتر خۆیان لەرق‌و قینی ﷻ بپارێزن، جا ئەمە وەكو لە چەند شوێنی تردا وتراوە ئامۆژگاری‌و وەبیر خستنەوەیە بۆ هەمو كەس بەڵام چونكە تەنها باوەڕداران سودی لێ وەر ئەگرن بۆیە فەرموی: ﴿لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ بۆ باوەڕداران.

(١٢١) ئەی محمدﷺ بڵێ: بەوانەی كە باوەڕیان نیە بە كەیفی خۆتان ئیشی خۆتان بكەن ئێمەش ئیشی خۆمان دەكەین. ئەمە هەڕەشەیەكی زۆر توندە، واتە: بێ منت بن چی ئەكەن بیكەن

(١٢٢) ئێوە چاوەڕوانی بكەن‌و ئێمەش چاوەڕوانی دەكەین. هەر چەند ئەمانە هەڕەشەیەكی توندن بەڵام ئەمانە بەر لە فەرزبونی جیهاد بوە.

(١٢٣) تەنها بۆ خوایە نهێنیەكانی ئاسمانان‌و زەوی‌و تەنها ئەو دەزانێت‌و عیلمی پێ‌ی هەیەو هەمو كارو بار هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە كەوابو دەی ئێوەش مادام هەمو ئیشەكانتان بۆلای ئەو ئەچێتەوە بیپەرستن تا شەرمەندەی نەبن‌و پشتیش ببەستن بەو، وەپەروەردگارت بێ ئاگانیە لەو شتەی كە ئێوە دەیكەن لە چاك‌و لە خراپ ئاگای لێیەتی هەرچاكەیەك كەبەتاڵتان نەكردبێتەوە پاداشتی وەرئەگرن‌و هەر خراپەیەكیش كە تەوبەتان لێ نەكرد بێ‌و ﷻ چاو پۆشی لێ نەكردبن سزاكەی وەردەگرن. دەی بۆ پێش هاتنی ئەورۆژە بیرلە حاڵی خۆمان نەكەینەوەو بۆ لەو قورئانە سود وەرنەگرین بەڵكو خوا ڕەحممان پێ بكاتو لەتاوانەكانمان چاوپۆشی بكات؟

## ١٢ سورەتی یوسف ١١١

سورەتی یوسف كە سورەتی دوانزەهەمی قورئانە،لە مەكەدا هاتوتە خوارەوە، سەدویانزە ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاوسێیەمەو پاش سورەتی (**هود**)و پێش (**ا جر**) دابەزیوە. جێنشینەكانی پێغەمبەر وەك عومەرو عوسمان ئەم سورەتەیان لە نوێژی بەیانیدا زۆر دەخوێندەوە. ناوی پێغەمبەر یوسف عليه السلام بیستو حەوت جار لە سێ سورەتی قورئاندا هاتوە یەكجار لە سورەتی غافرو یەكجار لە ئەنعام و بیستو پێنج جاریش لەم سورەتەدا. پێغەمبەرمان بە كەریمی كوڕی كەریم واتە رەوشت بەرزو بەناموس‌و بەخشندە ناوی دەباتو دەفەرموێ:{ الْكَرِيمُ ابْنُ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ ابْنِ الْكَرِيمِ يُوسُفُ بْنُ يَعْقُوبَ بْنِ إِسْحَاقَ بْنِ إِبْرَاهِيمَ/ متفق عليه/ كەریمی كوڕی كەریم كوڕی كەریمی كوڕی كەریم یوسفی كوڕی یەعقوبی كوڕی ئیسحاقی كوڕی ئیبراهیمە. وتراوە وشەی یوسف مانای دوو وشەی "الاسف" واتە غەم‌و پەژارە وە وشەی "الاسیف" واتە كۆیلەو بەندەی لە خۆ گرتوە، لە سورەتی پێشودا باسی گەلانی هەندێك لە پێغەمبەران كرا كە هەمویان دژایەتی پێغەمبەرەكانیان كرد كە سەرئەنجامی هەمویان لەناوچون‌و توش بون بە سزای پەروەردگار، بەڵام لێرەدا باسی بەسەرهاتی پێغەمبەرێكمان بۆدەكات كە لەم بەسەرهاتەدا سەرنجامی هەمولایەك بەخۆشی‌و گەڕانەوە بۆ لای حەق‌و راستی تەواو دەبێت.

قَالَ يَٰبُنَيَّ لَا تَقۡصُصۡ رُءۡيَاكَ عَلَىٰٓ إِخۡوَتِكَ فَيَكِيدُواْ لَكَ كَيۡدًاۖ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ يَجۡتَبِيكَ رَبُّكَ وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِ وَيُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَعَلَىٰٓ ءَالِ يَعۡقُوبَ كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيۡكَ مِن قَبۡلُ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَۚ إِنَّ رَبَّكَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٦﴾ ۞ لَّقَدۡ كَانَ فِي يُوسُفَ وَإِخۡوَتِهِۦٓ ءَايَٰتٞ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿٧﴾ إِذۡ قَالُواْ لَيُوسُفُ وَأَخُوهُ أَحَبُّ إِلَىٰٓ أَبِينَا مِنَّا وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّ أَبَانَا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٨﴾ ٱقۡتُلُواْ يُوسُفَ أَوِ ٱطۡرَحُوهُ أَرۡضٗا يَخۡلُ لَكُمۡ وَجۡهُ أَبِيكُمۡ وَتَكُونُواْ مِنۢ بَعۡدِهِۦ قَوۡمٗا صَٰلِحِينَ ﴿٩﴾ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ لَا تَقۡتُلُواْ يُوسُفَ وَأَلۡقُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّ يَلۡتَقِطۡهُ بَعۡضُ ٱلسَّيَّارَةِ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿١٠﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا لَكَ لَا تَأۡمَ۬نَّا عَلَىٰ يُوسُفَ وَإِنَّا لَهُۥ لَنَٰصِحُونَ ﴿١١﴾ أَرۡسِلۡهُ مَعَنَا غَدٗا يَرۡتَعۡ وَيَلۡعَبۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿١٢﴾ قَالَ إِنِّي لَيَحۡزُنُنِيٓ أَن تَذۡهَبُواْ بِهِۦ وَأَخَافُ أَن يَأۡكُلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَأَنتُمۡ عَنۡهُ غَٰفِلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُواْ لَئِنۡ أَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُ وَنَحۡنُ عُصۡبَةٌ إِنَّآ إِذٗا لَّخَٰسِرُونَ ﴿١٤﴾

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف،لام،را. هەر ﷲ باشتر ماناو مەبەستی ئەم پیتانە دەزانێت، ئەوە نیشانەکانی ئەو پەراوە رۆشن کەرەوەیە کە چاك وخراپ، هیدایەتو گومراهی، حەلاڵو حەرام، کوفرو ئیمان هەمو رون دەکاتەوە.

(٢) بێگومان ئێمە ئەوەمان بەخوێنراوەیەکی عەرەبی رەوانەکردوە بۆلای تۆ بۆ ئەوەی کە ئێوە فکر بکەنەوەو عەقڵ بخەنە کارەوەو راستو ناراست لە یەك جیا بکەنەوە.

(٣) بێگومان کەئێمە باس دەکەینو ئەخوێنینەوە بەسەرتا چاکترین داستان بەهۆی ئەوەی کە وەحیمان کردوەتە لات کە ئەم قورئانەیەو بێگومان کە تۆ لە پێش دابەزینی ئەم قورئانەدا لەم بارەوەهیچ شتێکت نەدەزانیو بێ ئاگا بوی. ئینجا بەچۆنیەتی ئەم داستانە بەنرخوپڕ لەپەندو ئامۆژگارییە دەست پێ دەکاتو ئەفەرموێ:

(٤) بیر بکەرەوەو باسی ئەوکاتەبکە کەیوسف بەباوکی گووت: ئەی باوکی خۆشەویستم بێگومان من لەخەودا دیم کە یانزە ئەستێرەو رۆژو مانگ سوجدەیان بۆ بردم.

(٥) جا یەعقوبی باوکی لە سەرەنجامی ئەم خەوە ئاگادارکرا بویەوە بۆیە وتی: ئەی کوڕی خۆشەویستم ئەم خەوەی خۆت بۆ براکانت باس مەکەچونکە ئەوان فێڵێکت پێ دەکەن، بێگومان کە شەیتان دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ بنیامو براکانت بەم خەوە حەسادەتت پێ ئەبەنو شەیتان هەڵیان ئەنێ لەسەر خراپەکاری بەرامبەرت کەواتە شەیتان هەمیشە لە هەوڵدایە بۆ تێکدانو ئاژەوا نانەوە لە بەینی مرۆڤدا، جا ئەو مرۆڤانە چەند لە یەك نزیکتر بن تێکۆشانی ئەو لەعینە زۆرتر دەبێت، وە دەرکەوت کە شاردنەوەی نیعمەت بۆ خۆپاراستن لە حەسودی ئیشێکی رەوایە جا بۆیە پێغەمبەرمان دەفەرموێ:{ **لا تُقص الرؤيا إلا على عالم أو ناصح** /الترمذي، صحه الالبا / خەون باس مەکە مەگەر بۆ عالێك یان بۆ مرۆڤێکی ئامۆژگاری کەر}

(٦) خۆ هەر ئاواش دەبێت کەپەروەردگارت هەڵتدەبژێرێ لەناو براکانتاو دەتکا بە پێغەمبەرو فێری لێکدانەوەی خەونەکانت دەکاتو نیعمەتی خۆی بەسەر تۆ وبەسەر بنەماڵەی یەعقوب دا تەواو دەکات وەك چۆن نیعمەتی خۆی تەواو کرد بەسەر هەردوو باوکی تۆدا کە ئیبراهیمو ئیسحاق بون لە پێش یەعقوب دا، بێگومان پەروەردگارەکەت زانەرەو دانایەو دەزانێ چیت پێ ئەدرێ ولەئایندەدا بەچی دەبی. جا لە پاش چل ساڵ ئەم خەونەی یوسف هاتەدی.

(٧) سوێند بێ کە بەراستی لەبەسەرهاتی یوسف وبراکانی کە یانزەکەس بون چەندین بەڵگە وئامۆژگاری گرنگ هەیە بۆ ئەوانەی کە پرسیار دەکەنو دەیانەوێ راستییان بۆ دەرکەوێ.

(٨) ئەو کاتەی کە براکانی وتیان: بەراستی یوسفو براکەی کە(بنیامین)ـە لەلای باوکمان لەئێمە نازارو خۆشەویستترن لە کاتێکدا کە ئێمە کۆمەڵە پیاوێکین، بێگومان باوکمان لەم بارەوە بەهەڵەدا چووە کە دوو کەسی لە دە کەس زیاتر خۆش ئەوەێ. چونکە دە کوڕ باشتر دەتوانن خزمەت بە باوکیان بکەنو سودی پێ بگەیەنن تا کو دوو کوڕ، وتراوە چونکە باوکیان ئایندەیەکی روناكو پلەیەکی بەرزی لەبەر چاو بو بۆ یوسفو لەلایەکی تر یوسف وبنیامین دایکان مردبو بۆیە یەعقوبی باوکیان نازی زۆرتری پێدەدان، جا ئەمە بو بە هۆی ئەوەی کە براکانیان حەسودیان پێیبەن.

(٩) ئەوسا وتیان: یوسف بکوژن تا کۆتای بەو خۆشەویستیە بێت یان فڕەی بدەنە ناوچەیەکی دور ئەوکاتە باوکتان رووی یەکلا دەبێت بۆ ئێوەو خۆشەویستییەکەی هەمو بۆ ئێوە دەبێت، ئینجا پاش نەمانی یوسف تەوبە دەکەنو دەبن بە گەلێکی چاکیش لەلای باوکتانو بەیەك چاو تەماشاتان دەکات و رێزی کەسی تر نادا بەسەرتاندا.

(١٠) یەكێك لەوانە وتی: یوسف مەكوژن بەڵكو فڕەی بدەنە ناو بیرەكەوە تا ڕێبوارێ هەڵی بگرێتەوە، ئەگەر هەر سورن لە سەر بڕیاری خۆتان كە یوسف لە باوكتان دوور بكەنەوە. ئینجا هاتن بۆ ئەنجامدانی ئەم كارەخراپە چونەلای باوكیان،

(١١) وتیان: ئەی باوكی ئێمە بۆچی لە بارەی (یوسف)ـەوە باوەڕت بە ئێمەنیە بۆچی دڵنیانیت لێمان‌و گومانی خراپمان لێ دەكەیت؟ خۆ بەبێگومان ئێمە دڵسۆزو ئامۆژگاری كەری ئەوین‌و چاكەی ئەومان دەوێت.

(١٢) بەیانی لەگەڵ ئێمەدا بینێرە تا بۆ خۆی بخواو رابوێرێ ویاری بكات، وە بێگومان كەئێمە بەباشی چاودێری دەكەین‌و لەهەمو ناخۆشیەك دەیپارێزین.

(١٣) بەڵام باوكی حەزی نەدەكرد كە بچێت لەگەڵیان دا بۆیە وتی: بێگومان من دڵ تەنگ‌و خەمبار دەبم بەوەی كە ئێوە ئەو ببن لەگەڵ خۆتانداو دەترسم گورگ بیخوات لەكاتێكدا كە ئێوە بێ ئاگا بن لێی‌و سەرگەرمی كارو ئیشی خۆتان بن. جا بەم شێوەیە یەعقوب بیانوشی دا بە دەست كوڕەكانی، واتە كاتێك كە گومانی خراپ بە كەسێك برا نابێت بەڵگەی بەدەست بدەیت كە دژ بە خۆت بەكاری بهێنێت وەك چۆن لێرەدا یەعقوب‌عليه السلام بۆ براكانی یوسف باس لە مەترسی كوشتنی یوسف بە هۆی گورگەوە دەكات.

(١٤) وتیان: ئەگەر بێت‌و گورگ بیخوات لەكاتێكداكە ئێمە كۆمەڵێكین بێگومان ئەوكاتە ئێمە كۆمەڵێكی بێ خێرو ڕەنجەڕۆین‌و زیانیكی گەورەمان لە خۆداوە. لێرەدا باوكی وتی: دڵ تەنگ‌و غەمبارم كەبیبەن‌و دەترسم كە گورگ بیخوات كەچی ئەوان وەڵامی دووهەمیان دایەوە، واتە: ئێمە ناهێڵین گورگ بیخوات چونكە مەبەستیان بو كەخەفەتی بۆ دروست بكەن ورقیان لەوەبو كە باوكیان بۆ تەنها ئەوی خۆش ئەوێ؟ بەڵێ هاتنە سەرئەوەی كەبیبەن لەگەڵ خۆیانداو ئامادەی ڕۆیشتن بون.

(١٥) جا لە كاتێك دا كە باوكیان رازی كردو یوسفیان لەگەڵ خۆیاندا بردو هەمویان هاتنە سەر ئەوەی كە بیخەنە بن بیرەكە، ئەوسا الله دەفەرموێ: ئا لەو كاتەدا وەحیمان كردە لای‌و پێمان وت: كە تۆ هەواڵی ئەم بەسەر هاتەیان پێ بڵێ لەكاتێكدا كەئەوان هەست پێ ناكەن. جا چ لەو كاتەدا بو بێت بەڵكو بیربكەنەوەو ئەو كارە نەكەن یان لەپاش كەوتنە ناوبیرەكەوە بێت تا دڵخۆش بێت‌و بزانێت كەلەو گرفتارییەش رزگاری دەبێت، ئەوەبو لە پاش ئەو ماوە درێژەی كە بەسەریدا تێپەڕی‌و بو بە فەرمانڕەوای

فَلَمَّا ذَهَبُواْ بِهِۦ وَأَجۡمَعُوٓاْ أَن يَجۡعَلُوهُ فِي غَيَٰبَتِ ٱلۡجُبِّۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ لَتُنَبِّئَنَّهُم بِأَمۡرِهِمۡ هَٰذَا وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٥﴾ وَجَآءُوٓ أَبَاهُمۡ عِشَآءٗ يَبۡكُونَ ﴿١٦﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ وَتَرَكۡنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئۡبُۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤۡمِنٖ لَّنَا وَلَوۡ كُنَّا صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ وَجَآءُو عَلَىٰ قَمِيصِهِۦ بِدَمٖ كَذِبٖۚ قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٞۖ وَٱللَّهُ ٱلۡمُسۡتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَجَآءَتۡ سَيَّارَةٞ فَأَرۡسَلُواْ وَارِدَهُمۡ فَأَدۡلَىٰ دَلۡوَهُۥۖ قَالَ يَٰبُشۡرَىٰ هَٰذَا غُلَٰمٞۚ وَأَسَرُّوهُ بِضَٰعَةٗۚ وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَشَرَوۡهُ بِثَمَنِۢ بَخۡسٖ دَرَٰهِمَ مَعۡدُودَةٖ وَكَانُواْ فِيهِ مِنَ ٱلزَّٰهِدِينَ ﴿٢٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي ٱشۡتَرَىٰهُ مِن مِّصۡرَ لِٱمۡرَأَتِهِۦٓ أَكۡرِمِي مَثۡوَىٰهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوۡ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدٗاۚ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلِنُعَلِّمَهُۥ مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ وَٱللَّهُ غَالِبٌ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِۦ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢١﴾ وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥٓ ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَكَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٢٢﴾

میسر، براكانی چون بۆ كاروان‌و دەغڵ‌و دان كڕین ئەو ناسینیەوە بەڵام ئەوان یوسفیان نەناسیەوە، پاشان پێیگوتن كە چییان بەسەر براكەی خۆیان هێناوە؟ بەڵێ ئەوان یوسفیان لەو بیرەدا بەجێ هێشت‌و پۆشاكەكەیان خوێناوی كرد،

(١٦) جا هاتنەوە لای باوكیان لە وەختی نوێژی عیشاداو لەحاڵێكدا كە دەگریان،

(١٧) وتیان: ئەی باوكی خۆمان بێگومان ئێمە ڕۆیشتین‌و كێ بەركێمان دەكردو یوسفمان لەلای كەل‌و پەلەكانمان بەجێ هێشت جا لەو كاتەدا گورگ خواردی. ئەگەرچی دەزانین تۆ باوەڕمان پێ ناكەیت با ڕاستیش بكەین. هەندێ لە پیشبڕكێكان بەوەرگرتنی خەڵاتیش هەر ڕەوایە وەك تیر هاوێشتن و ئەوانەی كە سودی بۆ دین و جیهادكردنی تێدابێ.

(١٨) خوێنێكی درۆزنانەیان هێنا بەسەر كوراسەكەیدا، بەڵام لە بیری ئەوەدا نەبون كە بیدڕێنن لەگەڵ خوێناوی كردنەكەی دا جا باوكی كاتێ كەدی كراسەكە نەدڕاوە دەڵێن وتویەتی: گورگێكی دانا بوە كە كوڕی منی خواردوەو كوراسەكەی نەدڕاندوە! هەر بەوە زانی كە قسەكانیان ڕاست نیەو وتی: نەخێر ئەوە وانیە بەڵكو نەفستان شتێكی بۆ جوان كردون‌و ئەنجامتان داوە، بە هەرحاڵ هەر چۆن بوە ئیشەكەی من ئەوەیە كەبەچاكی خۆم بگرم‌و بەئێوە هیچ نەڵێم، وەهەر الله یە داوای یارمەتی لێ

وَرَٰوَدَتۡهُ ٱلَّتِي هُوَ فِي بَيۡتِهَا عَن نَّفۡسِهِۦ وَغَلَّقَتِ ٱلۡأَبۡوَٰبَ وَقَالَتۡ هَيۡتَ لَكَۚ قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ رَبِّيٓ أَحۡسَنَ مَثۡوَايَۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ هَمَّتۡ بِهِۦۖ وَهَمَّ بِهَا لَوۡلَآ أَن رَّءَا بُرۡهَٰنَ رَبِّهِۦۚ كَذَٰلِكَ لِنَصۡرِفَ عَنۡهُ ٱلسُّوٓءَ وَٱلۡفَحۡشَآءَۚ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٢٤﴾ وَٱسۡتَبَقَا ٱلۡبَابَ وَقَدَّتۡ قَمِيصَهُۥ مِن دُبُرٖ وَأَلۡفَيَا سَيِّدَهَا لَدَا ٱلۡبَابِۚ قَالَتۡ مَا جَزَآءُ مَنۡ أَرَادَ بِأَهۡلِكَ سُوٓءًا إِلَّآ أَن يُسۡجَنَ أَوۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ قَالَ هِيَ رَٰوَدَتۡنِي عَن نَّفۡسِيۚ وَشَهِدَ شَاهِدٞ مِّنۡ أَهۡلِهَآ إِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن قُبُلٖ فَصَدَقَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٦﴾ وَإِن كَانَ قَمِيصُهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ فَكَذَبَتۡ وَهُوَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٧﴾ فَلَمَّا رَءَا قَمِيصَهُۥ قُدَّ مِن دُبُرٖ قَالَ إِنَّهُۥ مِن كَيۡدِكُنَّۖ إِنَّ كَيۡدَكُنَّ عَظِيمٞ ﴿٢٨﴾ يُوسُفُ أَعۡرِضۡ عَنۡ هَٰذَاۚ وَٱسۡتَغۡفِرِي لِذَنۢبِكِۖ إِنَّكِ كُنتِ مِنَ ٱلۡخَاطِـِٔينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقَالَ نِسۡوَةٞ فِي ٱلۡمَدِينَةِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ تُرَٰوِدُ فَتَىٰهَا عَن نَّفۡسِهِۦۖ قَدۡ شَغَفَهَا حُبًّاۖ إِنَّا لَنَرَىٰهَا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾

دەكرێت لەسەر ئەو قسەو باسەی كە ئێوە دەیكەن، بۆ رونكردنەوەی ئەم روداوە دڵ تەزێنە داوای یارمەتی تەنها لە ﷲ دەكەم.

﴿١٩﴾ جا قەدەری پەروەردگاری عالەم لەسەر ئەوەبو كە گوزەری جەماعەتێك كەوتە ئەوشوێنە، جا كاروانێك هاتو ئاوهێنەری خۆیان نارد بۆ ئاودەر هێنان بۆیان، ئینجا ئەو كابرایە كەهاتە سەر بیرەكە جا ئەوسەتڵەی كەپێی بوو بۆ ئاو دەرهێنان فرەی دایە ناو بیرەكەوە یوسف كە ئەو سەتڵەی دی خۆی بەست بەو پەتی سەتڵەوە جا كاتێ كە ئەو كابرایە سەتڵەكەی هەڵێكێشایەوە دی وا منداڵێكی نزیك بەباڵقبون لەگەل سەتڵەكەدا هاتەسەرەوە وتی: ئەی خەڵكینە موژدە بێت ئەمە كورێكە جا بۆ ئەوەی كەسی تر پیان نەزانێتو نەبێ بەشەریكیانو كەسیش داوایان لێ نەكاتەوە ئەوان لە ناوكەلو پەلی خۆیان دا شاردیانەوە تا بۆ خۆیان بیفرۆشنو قاڵیبرنەوە، بێ ئاگا لەوەی كە ﷲ دەیەوێت بەو ئیشەی ئەوان قاڵی بڵاو بكاتەوە، خوا زۆر زانایە بەوەی كە ئەوان دەیكەن.

﴿٢٠﴾ خۆ ئەوان بەنرخێكی كەم فرۆشتیانو ئەوان لەو دراوانە بێ نیاز بون و تەماعیان پێی نەبو، واتە: گرنگیان پێنەداو بە شتێكی زۆر كەمیان دەزانی جا هەر ویستیان لە مل خۆیانی بكەنەوە، هەندێك دەڵێن: براكانی هەرلەوێ بون تا ئەو كاروانە هاتو بەكابرای ئاو دەرهێنەریان وت: ئەو منداڵە هی ئێمەیەو دەیفرۆشین جا بەو پارە كەمە فرۆشتیان بەو كاروانیانەو یوسفیش لە ترسی ئەوە نەوەك بیكوژن قسەی نەكرد، جا ئەو قافلەیە بەرەو میسر رۆیشتنو گەیشتنە شارو یوسفیان فرۆشت بەپاشای ئەو شارەو دەڵێن موسڵمان بوە.

﴿٢١﴾ جا ئەو كەسەی كە یوسفی كڕی لە میسرا بەخێزانەكەی وت:رێزی بگرە، بەڵكو ئەمە سودمان پێ بگەیەنێت یان بیكەین بەمنداڵی خۆمان. ئینجا ﷲ ی زاناو دانا ئەفەرموێ: جا هەر ئاوەها یوسفمان سەقامگیر كردو جێگامان بۆ سازاند لەسەر زەویداو فێری دەكەین كە چۆن لەقسەكان تێ بگات كاتێ كە وەحیمان كردە لایو چۆن مانای خەونەكان لێك بداتەوە. جا بێگومان كە ﷲ زاڵە بەسەر هەموو كاروبارەكانیداو ئەوەی بییەوێت بە جێی دەهێنێت كەپێگەیاندنو تێگەیاندنی یوسف بەشێكی كەمە لەكردارە جوانەكانی بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن. بەڵێ، براكانی نەیان دەزانی بۆچی باوكیان ئەوندە یوسف ی خۆش ئەوێ، بەڵام باوكیان ئایندەیەكی روناكی لەبەر چاو بو بۆ یوسف ی ونبو، براكانی یوسف بە گومانی خۆیان ویستان یوسف بێ نازو سەركز كەن بەڵام نەیاندەزانی پیلانەكانیان هەنگاوانێكن بۆ بەرزكردنەوەی زۆرتری یوسفو بەدیهێنانی خەونەكەی، دەڵێن ئەوەی كە یوسفی كڕی گەورەی میسر بووەو ناوی قیتفیر بووەو ناوی خێزانەكەشی (زەلیخا)بوە هەرچەند لەناوی هەردووكیان قسەی تر كراوە، گرنگ روداوەكەی یوسفە نەك ناوەكان، چونكە ئەگەر ناوەكان گرنگ بوایە خوای زاناو دانا باسی دەكرد ئەڵێن كەئەو پاشایە نەدەچوە لای ئافرەتو منداڵی نەبووەو لەو لاویشەوە بێگومان دەركێكی چاكی كرد كە ئەم منداڵە گومانی خەیرو چاكەی لێدەكرێت، وتراوە: سێ كەس هەستی باشیان هەبوە، یەكێك لەوانە بریتیە لەم پاشای میسرە كە چاوی بەیوسف كەوت بەخێزانەكەی وت: رێزی بگرە، نزیكە ئەم منداڵە لەپاشدا سودمان پێ بگەیەنێت.

دووهەمیان: كچی شوعەیب كە موسای دی وتی بەباوكی: ئەم پیاوە بكە بەمزوری خۆت زۆر بەهێزو ئەمینە.

سێهەمیان: ئەبوبەكر كە عومەری دانا لە جێگای خۆیدا بۆ جێنشینی(الخلافە).

﴿٢٢﴾ جا لە كاتێكدا كەیوسف گەیشتە تەمەنی بەهێزیو باڵق بوونو كەماڵ، حوكمو علیمان پێدا، ئەرێ ئێمە هەر ئاوەها پاداشی چاكەكاران ئەدەینەوە. خوێنەری بەرێز بەدڵەوەلەم داستانە راستە وردبەرەوە بەراستی پوختەی عەقیدەو ئەخلاقی تێدایەودەرخەری سۆزو میهرەبانی خوای داناوزانایە سەبارەت بەبەندەكانیومایەی هێزو ورەبەرزكردنەوەی باوەرِدارانەو روخێنەری بیروبۆچونی پیلانگێرِو خیانەتكارانە.

(٢٣) جائەم ئافرەتەی کە کاتی خۆی یوسفی بۆ کڕاو لە ماڵی دایە داوای ئەنجامدانی کاری خراپی لێ کرد، جا بۆ ئەم مەبەستە یوسف ی بردە ژوورەوەو هەمو دەرگاکانی داخستو پێی وت: وەرە ئامادەیە بۆت. وتی پەنا ئەگرم بەخوا: کەمن شتی وا بکەم بێگومان کە ئەو پیاوە سەرپەرشتی منەو تۆ خێزانی ئەویو بە جوانی رێزی منی گرتوە، جا من چۆن خیانەتی وا بەناموسی ئەو دەکەم، ئەگەر شتی وابکەم من ستەمکارمو بێگومان کە ﷲ ستەمکاران رزگار ناکات. وتراوە کە ئەو پاشایە لەپاشا لەسەردەستی یوسف موسڵمان بوەو ناوی رەیانی کوڕی وەلید بوەو ئەم عەزیزەی خاوەنی یوسف میرێك بوە لە میرەکانی ئەو پاشایەو وەکو وتمان، جا وتراوە ئەویش موسڵمان بووە. جا کاتێك کە ئەو ژنە بانگی یوسف ی کردو پێی وت: پێویستە ئەو ئیشە بکەی خوا ئەفەرموێ:

(٢٤)بێگومان ئافرەتەکە مەبەستی ئەوە بو کە ئەو خراپەیە بکاتو ئەویش مەبەستی خراپەی کرد وەکو بەشەرو نەفسی پێی خۆشبو ئەگەر بەڵگەی روناکی خوای خۆی نەبینایە بەڵام چونکە ئەو دەیان بەڵگەی روناکی لەهێزو زانایی وکاربەجێی خوای دیبو ئەو کارەی ئەنجام نەدا. وتراوە وشەی(لَوۡلَآ ) بۆنەکردنە لەبەربونی غەیر واتە، لەبەر بوونی بەڵگەی رون ئەو کارەی ئەنجام نەدا بۆیە ﷲ ئەفەرموێ: هەر ئاوەها کەچۆن بەڵگەی رونمان پیشان دا خراپەو داوێن پیسیشمان لەو دور خستەوەو نەمانهێشت کە ئەو تاوانە خراپەی دوچار ببێو شەرمەندەی لای خواو لای گەورەکەی ببێ چونکە بێگومان ئەو لەبەندە هەڵبژێرراو پاڵفتەکانی ئێمە بو.

(٢٥) ئەوسا هەردووکیان بەپەلە بەرەو دەرگای هاتنە دەرەوە رایان کرد یوسف بۆ دەرچونو ئەویش بەشوێن یوسف دا کەنەیەڵێت دەربچێت بەڵکو رازی بکاتو لە پشتەوە لە نزیك دەرگاوە کراسەکەی گرت کەبیگەڕێنێتەوەو یوسفیش هەر بەرەو دەرگا زۆری کرد تا کوراسەکەی دڕاندو لەدەستی دەرچو، جا هەرکە هاتنەدەرەوە لەودەرگادا هەڵتەقین بە مێردەکەی داو زانی پێی زانیون زوو فریای خۆی کەوتو یوسفی بەخراپەکار نیشاداو هاواری کردو وتی: تۆڵەی ئەو کەسەی کە ویستویەتی خراپە لەگەڵ خێزانی تۆدا بکات هیچ نیە بێجگە لەوەی کەزیندان بکرێت یان سزای دەردناك بدرێت، بەم شێوەیە یوسفی بە تاوانبار پیشاندا،

(٢٦) یوسفیش کەلە راستیدا پاك بو بەخێرای وەڵامی دایەوە وتی: نەخێر ئەو داوای لەمن کردوەو من هیچ شتێکم لەگەڵ ئەودا ئەنجام نەداوە، جا ئەم هەواڵە لەناو خزمانی نزیکی پیاوو ژنەکەدا بلاوبویەوەو کەوتنە لێکۆڵینەوەی‌و هەندێکیان بیروڕای خۆیان دەربارەی دەربڕی وەکو ئەفەرموێ:جا شایەتێك لە خزمانی ئافرەتەکە شایەتی داو وتی: ئەگەر کراسەکەی لە پێشەوە دڕا بێ ئەوە ئافرەتەکە راست دەکاتو وەئەو درۆ دەکات.

(٢٧)خۆ ئەگەر کراسەکەی لە پشتەوە دڕابێ ئەوە ئافرەتەکە درۆ دەکاتو ئەو لە راستگۆیانە، چونکە ئەگەر یوسف داوای خراپەی لێ بکردایە ئافرەتەکە روبەروی دەبویەوەوکراسەکەی لە پێشەوە ئەگرتو ئەیدڕاند بەڵام ئەگەر ئافرەتەکە داوای خراپەی کرد بێتو یوسف پشتی تێ کردبێ ئافرەتەکە لە پشتەوە کراسەکەی گرتوەو دڕاندویەتی، دیارەئەم قسە کەرەش پیاو ماقوڵو باوەڕ پێکراوی مێردی ئافرەتەکە بو بۆیە باوەڕیان پێکردوەو هاتون تەماشای کراسەکەی یوسفیان کردوە،

(٢٨) جا کاتێ دی کراسەکەی لە پشتەوە دڕاوە تێگەیشت کە یوسف راست دەکات، بۆیەروی کردەخێزانەکەی‌و وتی: بێگومان کەئەمە بەشێکە لە فێڵ‌وفڕەکانتان، بەبیشك کەفرتو فێڵی ئێوە زۆر گەورەیە، بەڵێ وایەچونکە ﷲ ئەفەرموێ: فڕوفێڵی شەیتان لاوازە بەڵام لەبارەی فڕوفێڵی ئافرەتانەوە ئەفەرموێ:زۆر گەورەیە، ئینجا روی کردە یوسفو وتی:

(٢٩) ئەی یوسف باسی ئەمە مەکەو مەیکە بەدەنگوباس لەناو خەڵکداو بەخێزانیشی وت: داوای لێخۆشبون بکە بۆ تاوانو گوناهی خۆت بێگومان تۆ یەکێکیت لە تاوانباران تۆ خۆت ئەمەت کردوەو بوختانیش بۆ یوسف دەکەیت؟! وەك ئەڵێن"قسە کەوتە زارێ دەکەوێتە شارێ" ئەم قسەیەش کەوتە سەردەمی خەڵكو لەم لاو لا باسیان دەکرد وەکو خوای زاناو دانا بۆمان باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٠) کۆمەڵێك لە ژنانی شارەکە کە ئەم هەواڵەیان بیستبو وتیان: بێگومان ژنی عەزیز خۆی داوای کردوە لەگەنجەکەی خۆی کە خزمەتچیەتی لەگەڵیدا بگونجێت بۆ ئەو کارەو بێگومان کە خۆشەویستی ئەو چووەتە ناڵدیوزاڵ بوە بەسەریاو چاری خۆی ناکات بێگومان ئێمە وائەزانین کە ئەو والە گومڕاهیەکی ئاشکرادا وسەری لێ تێکچوە.

فَلَمَّا سَمِعَتْ بِمَكْرِهِنَّ أَرْسَلَتْ إِلَيْهِنَّ وَأَعْتَدَتْ لَهُنَّ مُتَّكَـًٔا وَءَاتَتْ كُلَّ وَٰحِدَةٖ مِّنْهُنَّ سِكِّينٗا وَقَالَتِ ٱخْرُجْ عَلَيْهِنَّۖ فَلَمَّا رَأَيْنَهُۥٓ أَكْبَرْنَهُۥ وَقَطَّعْنَ أَيْدِيَهُنَّ وَقُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا هَٰذَا بَشَرًا إِنْ هَٰذَآ إِلَّا مَلَكٞ كَرِيمٞ ﴿٣١﴾ قَالَتْ فَذَٰلِكُنَّ ٱلَّذِي لُمْتُنَّنِي فِيهِۖ وَلَقَدْ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ فَٱسْتَعْصَمَۖ وَلَئِن لَّمْ يَفْعَلْ مَآ ءَامُرُهُۥ لَيُسْجَنَنَّ وَلَيَكُونٗا مِّنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ رَبِّ ٱلسِّجْنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدْعُونَنِيٓ إِلَيْهِۖ وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ أَصْبُ إِلَيْهِنَّ وَأَكُن مِّنَ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱسْتَجَابَ لَهُۥ رَبُّهُۥ فَصَرَفَ عَنْهُ كَيْدَهُنَّۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ بَدَا لَهُم مِّنۢ بَعْدِ مَا رَأَوُاْ ٱلْأٓيَٰتِ لَيَسْجُنُنَّهُۥ حَتَّىٰ حِينٖ ﴿٣٥﴾ وَدَخَلَ مَعَهُ ٱلسِّجْنَ فَتَيَانِۖ قَالَ أَحَدُهُمَآ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَعْصِرُ خَمْرٗاۖ وَقَالَ ٱلْأٓخَرُ إِنِّيٓ أَرَىٰنِيٓ أَحْمِلُ فَوْقَ رَأْسِي خُبْزٗا تَأْكُلُ ٱلطَّيْرُ مِنْهُۖ نَبِّئْنَا بِتَأْوِيلِهِۦٓۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٦﴾ قَالَ لَا يَأْتِيكُمَا طَعَامٞ تُرْزَقَانِهِۦٓ إِلَّا نَبَّأْتُكُمَا بِتَأْوِيلِهِۦ قَبْلَ أَن يَأْتِيَكُمَاۚ ذَٰلِكُمَا مِمَّا عَلَّمَنِي رَبِّيٓۚ إِنِّي تَرَكْتُ مِلَّةَ قَوْمٖ لَّا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَهُم بِٱلْأٓخِرَةِ هُمْ كَٰفِرُونَ ﴿٣٧﴾

(٣١) جا کاتێك قسەی ئەو ژنانە گەیشتەوە گوێی زەلێخا ئاشکرایە کە قسەو تانەو تەشەری ئەوانی پێ ناخۆش بو، چونکە لەبەر جوانخاسیو کەم وێنەی یوسف خۆی لەم کارەدا بەرەوا ئەزانی، جا بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێت کە خۆشەویستیەکەی نارەواو بێجێ نیە ناردی بەشوێنیانداو بانگی کردنو جێاگایەکی بۆ رازاندنەوەو سفرەو خواردنێکی بۆ ئامادە کردنوهەریەکەی کێردێکی میوەلەتکردنی پێدان ولە کاتی لەت کردنی میوەکەدا، کەیوسفی لەوان شاردبویەوە وتی: وەرەبچۆ بەناویاندا، یوسفیش هاتو بە شێوەیەکی جوانو بەئەدەبەوە بەناو ئافرەتەکاندا تێپەڕی، جا کاتێك کە یوسفیان دی زۆر بەلایانەوە گەورەو بەرێزو جوانو بەسام بو، جا لەبەر تەماشا کردنی یوسف ئاگایان لەدەستو کێرد نەماو دەستی خۆیان بری، ئا بەم شێوەیە تێیگەیاندن کە خۆشەویستیەکەم رەوایە ئەوانیش وتیان: نەخێر پاكو بێ عەیبی بۆ خوا ئائەم جوانو شۆخو شەنگە مرۆڤ نیە ئەمە بێجگە لە فریشتەیەکی بەرێز شتێکی تر نیە،

(٣٢) ئینجا زەلێخا پەردەی لەسەر خۆشەویستی بۆ یوسف لاداو بەراشکاوی وتی: ها ژنەکان ئا ئەوەیە کە ئێوە تانەو تەشەرتان لەمن داوە، بێگومان کەمن خۆم داوام کردوە لەو واتە دانی نا بە بێگوناهیو پاکی یوسفداو وتی: بەلاَم ئەو خۆی پاراستوەو هیچی لەگەلٚ مندا نەکردوە، جا ئەگەر ئەوەی کەمن ئەمری پێ دەکەم نەیکات ئەبێ بەند بکرێت، وەئەبێ ئەو لەریزی مرۆڤە بێ دەسەلاَتو کەم نرخەکاندا بێت.

(٣٣) جا کتو پڕ یوسفیش لەوەلاَمی دا وتی: ئەی پەروەردگارم بەندینخانەم پێ چاکترو خۆشەویست ترە لەوەی کەمنی بۆ بانگ دەکەن، واتە: چۆنە بەندینخانە هەلٚ ئەبژێرم نەك ئەنجامدانی ئەو ئیشە. وە ئەگەرخۆت من لە فڕوفێلٚی ئەوان لانەدەیتو یارمەتیم نەدەیت منیش مەیلی ئەوان دەکەمو ودوچاری تاوان ئەبم، جا ئەو کاتەش من لە ریزی مرۆڤە نەفامەکاندا دەبم. ئابەم شێوەیە یوسف پاڕایەوە لە پەروەردگاری،

(٣٤) پەروەردگاریش تکاکەی وەرگرتو فڕوفێلٚی ئەوانی لێ لادا، واتە: بتەوترو بەهێزتری کرد بێگومان کە ئەو زاتە بیسەرە بۆ هەمو داخوازیەکانی مرۆڤ، وە زانەرە بە هەمو ئیشەکانی.

(٣٥) لەپاشان بۆیان دەرکەوت کە مرۆڤێکی پاكو خاوێنەو تێکەلاَو بەو شتانە نابێ بەلاَم ناگونجێت هەر ئاوا بمێنێتەوەو لەناو خەلٚکدا باسی بکرێتو خێزانی گەورەی میسر ناوی زیاتر بزڕێت لە بەر ئەوە سوێندیان خوارد ئەبێت هەتا ماوەیەك بخرێتە بەندیخانەوە،

(٣٦) بەلٚێ خرایە بەندیخانەوەو لەو کاتەشدا دووکەس لە دەستو دایەرەی گەورەی میسر لەگەلٚ ئەودا چونە بەندیخانەوە یەکێکیان خواردنی بۆ پاشا دروست دەکردو ئەوی تریان ئاوی بۆ دەهێنا ئەلێن ویستویانە کە ژار بکەنە ناو خۆراك بۆی بەلاَم ئەوەی کە ئاوی پێ سپێررابو نەیکرد ئەوی تر کە خواردنی بۆ دروست دەکرد ژاری کردە ناو خواردنەکەیەوە، جا ئەوەی کە ئاوی بۆ ئەهێنا زانی کە ژار کراوەتە خواردنەکەی پاشاوە، وتی بە پاشا: ئەو خواردنە مەخۆ کابرای خواردن دروست کەریش وتی ئەی پاشام ئەو ئاوەی ئەو مەخۆرەوە چونکە ژاری تێکردوە، جا پاشا داوای لە هەردووکیان کرد کە هەر یەکەی لە هی خۆیان بخۆن کابرای ئاوهێنەر خواردیو هیچی لێ نەهات چونکە هیچی تێدا نەبو بەلاَم کابرای خواردن دروستکەر خواردنەکەی خۆی نەخوارد، جا پاشا فەرمانی دا بە بەندکردنی هەردووکیانو خرانە بەندیخانەوە، جا کاتێ یوسفیان دی کە پیاوێکی دەستو دەم پاكو راستگۆو چاکەکارە لەگەلٚ بەندکراوەکانداو لەمانای خەو پەرژێن کردن ئەزانێ زۆریان خۆش ئەویست جا لەو کاتەی کەبەندبون لەگەلیدا هەردووکیان خەویان دیو بۆ خەو پەرژێن کردن هاتنە لای یوسفو باسی خەوەکانی خۆیان بۆکرد، یەکێکیان وتی: من دیم خەریکم ترێ دەگوشم بۆ پاشام وەکو جاری جارانو ئەوی تریان وتی: من خۆم دی لەخەودا کەبە

وَٱتَّبَعۡتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَۚ مَا كَانَ لَنَآ أَن نُّشۡرِكَ بِٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ ذَٰلِكَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ عَلَيۡنَا وَعَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٨﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ ءَأَرۡبَابٞ مُّتَفَرِّقُونَ خَيۡرٌ أَمِ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٣٩﴾ مَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ أَسۡمَآءٗ سَمَّيۡتُمُوهَآ أَنتُمۡ وَءَابَآؤُكُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ بِهَا مِن سُلۡطَٰنٍۚ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٠﴾ يَٰصَٰحِبَيِ ٱلسِّجۡنِ أَمَّآ أَحَدُكُمَا فَيَسۡقِي رَبَّهُۥ خَمۡرٗاۖ وَأَمَّا ٱلۡأٓخَرُ فَيُصۡلَبُ فَتَأۡكُلُ ٱلطَّيۡرُ مِن رَّأۡسِهِۦۚ قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ ٱلَّذِي فِيهِ تَسۡتَفۡتِيَانِ ﴿٤١﴾ وَقَالَ لِلَّذِي ظَنَّ أَنَّهُۥ نَاجٖ مِّنۡهُمَا ٱذۡكُرۡنِي عِندَ رَبِّكَ فَأَنسَىٰهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ ذِكۡرَ رَبِّهِۦ فَلَبِثَ فِي ٱلسِّجۡنِ بِضۡعَ سِنِينَ ﴿٤٢﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ إِنِّيٓ أَرَىٰ سَبۡعَ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعَ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖۖ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ أَفۡتُونِي فِي رُءۡيَٰيَ إِن كُنتُمۡ لِلرُّءۡيَا تَعۡبُرُونَ ﴿٤٣﴾

سەرم نانم هەڵگرتبو کە باڵندە لێیدەخوارد پێمان بڵێ بابزانین کە مانای ئەو دوو خەوەی ئێمە چیە چونکەبێگومان کەئێمە تۆ بەمرۆڤێك لە مرۆڤە چاکەکارەکانت دەزانین. ئینجا یوسفیش ئەمەی بەهەل زانی بۆ گەیاندنی پەیامەکەیو پێش وەڵامی خەوەکانیان راستی بیرو ڕاکەی خۆیو پوچەڵی بیروڕای ئەوانی بۆ رون کردنەوە.

﴿٣٧﴾ وتی: هیچ خواردنێك بۆ ئێوە نایەتو هیچ پێ بژیوێکتان پێ نادرێت مەگەر من خەبەرتان پێ بدەم کەچییە پێش ئەوەی پێتان بگات، واتە: خودا هەندێك لە کارو بارە نهێنیەکانم بۆ رۆشن دەکاتەوە پێش روودانی ئەمەش کەمن بە ئێوە ئەڵێم بەشێکە لەوەی کە پەروەردگارم فێری کردوم واتە ئەوە بەخششێکی پەروەردگارمە، چونکە بێگومان من وازم هێناوە لە ئاینی گەلێك کە باوەڕ ناهێنن بە ﷲ و بێ باوەڕن بەرۆژی دوایی.

﴿٣٨﴾ جا من شوێن ئاینی باوکانی خۆم کە ئیبراهیم وئیسحاق ویەعقوبە کەوتووموو بۆ ئێمە نیە هەرگیز هیچ هاوبەشێك بۆﷲ بڕیار بدەین ئەوە زیادەڕێزو بەهرەیەکی ﷲ یە لەسەر ئێمەو لەسەر هەمو خەڵکیش بەڵام زۆربەی خەڵك شوکرو سوپاسی ئەو نیعمەتە گەورەیە ناکەن کەﷲ پێی بەخشیون، جا یوسف لە درێژەی قسەکانیا روی کردە ئەو دو بەندکراوەو بەوشەی جوان وتی:

﴿٣٩﴾ ئەی دوو هاوڕێکانی بەندیخانەم ئایا خودایانی جیا لەیەك چاکن یان یەك خودای بە توانا؟وتی:

﴿٤٠﴾ ئەوانەی کە ئێوە دەیانپەرستن بێجگە لە چەند ناوێك کە خۆتانو باو باپیرانتان بۆتان داناون شتێکی ترنین کە ﷲ یش هیچ بەڵگەیەکی لەسەر پەرستنی ئەوانە نەناردوە، فرمانوبڕیاردان تەنها بۆ ﷲ یە، چونکە ئەم بونەوەرە دروستکراوی ئەوەوهەر ئەودەزانێت چ شتێك بەسوود یان بە زیانیانەو خۆ تێ هەڵقورتان لە کاروباری خەڵکدا مادام ئەورێگای پێ نەدابێت دەست درێژی کردنە سەرمافی ﷲ یەو تاوانێکە هەمو بوونەوەر دژایەتی دەکات. دەستوری داوە کە نابێت کەس بپەرستن بێجگە لەخۆی، ئائەوەیە ئاینێکی راستو بەنرخ بەڵام زۆربەی خەڵك ئەم حەقیقەتەنازانن‌و بە ڕێگای چەوتو نارێك دا ئەڕۆن. ئینجا دێتە سەرلێکدانەوەی خەوەکانیان‌و وتی:

﴿٤١﴾ ئەی دوو هاوڕێکانی بەندیخانەم، یەکێك لە ئێوە رزگار ئەبێتو ئەچێتە لای پاشاکەیو وەکو جارانی پێشو خواردنەوەی بۆ دروست دەکاتو ئەوی ترتان هەڵدەبەسرێتو دەکوژرێتو سەری باڵندە دەیخوات. ئەڵێن کەئەمەیان بیست وتیان: خەومان نەدیوە. یوسف وتی: ئەو کاروبارەی کە لەبارەیەوە داوای خەوپەرژێنتان لەمن کرد چ راست بکەن لە خەوبینین‌و چ راست نەکەن جێ بەجێ کرا.

﴿٤٢﴾ئینجا روی کردە ئەو کەسەیان لەو دو رەفیقەی کە دڵنیا بو لە بەندیخانە رزگار ئەبێ وتی: کاتێ کە چویتە دەرەوە لای پاشاکەت باسی من بکە بەڵکو ئازادم بکات لەم بەندیخانە، ئابەم قسەیە شەیتان باسی پەروەردگاری خۆی لە بیر بردەوەو چاوەڕوانی خەڵکی تری کرد کەلە بەندیخانە رزگاری بکات، جا لەبەر ئەو کەمە مەیلەی کە کردی بۆ لای بێجگە لەﷲ ماوەی چەند ساڵ لەو زیندانەدا مایەوە، هەندێك ئەڵێن کابرای ئازاد کراو لە بیری چو، هەردوو ئەگونجێت والله اعلم. تا پاشای میسر خەوێکی دیو جاریان دا بەناو خەڵکا.

﴿٤٣﴾ پاشا وتی: خەوێکم دیوە کەلە خەودا حەوت مانگای لەڕ حەوت مانگای قەڵەویان خواردو حەوت گوڵە گەنمی وشك حەوت گوڵە گەنمی تەڕیان خوارد وتی: ئەی پیاو ماقوڵ‌و خەوپەرژێن زانان مانای ئەم خەوەم بۆ بکەن ئەگەر مانای خەوبینین ئەزانن، ئەوانیش هەرچی ورد بونەوە لەمانای ئەو خەوە تێنەگەیشتن.

قَالُوٓاْ أَضۡغَٰثُ أَحۡلَٰمٖۖ وَمَا نَحۡنُ بِتَأۡوِيلِ ٱلۡأَحۡلَٰمِ بِعَٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ وَقَالَ ٱلَّذِي نَجَا مِنۡهُمَا وَٱدَّكَرَ بَعۡدَ أُمَّةٍ أَنَا۠ أُنَبِّئُكُم بِتَأۡوِيلِهِۦ فَأَرۡسِلُونِ ﴿٤٥﴾ يُوسُفُ أَيُّهَا ٱلصِّدِّيقُ أَفۡتِنَا فِي سَبۡعِ بَقَرَٰتٖ سِمَانٖ يَأۡكُلُهُنَّ سَبۡعٌ عِجَافٞ وَسَبۡعِ سُنۢبُلَٰتٍ خُضۡرٖ وَأُخَرَ يَابِسَٰتٖ لَّعَلِّيٓ أَرۡجِعُ إِلَى ٱلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَعۡلَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالَ تَزۡرَعُونَ سَبۡعَ سِنِينَ دَأَبٗا فَمَا حَصَدتُّمۡ فَذَرُوهُ فِي سُنۢبُلِهِۦٓ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تَأۡكُلُونَ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ سَبۡعٞ شِدَادٞ يَأۡكُلۡنَ مَا قَدَّمۡتُمۡ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلٗا مِّمَّا تُحۡصِنُونَ ﴿٤٨﴾ ثُمَّ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ عَامٞ فِيهِ يُغَاثُ ٱلنَّاسُ وَفِيهِ يَعۡصِرُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦۖ فَلَمَّا جَآءَهُ ٱلرَّسُولُ قَالَ ٱرۡجِعۡ إِلَىٰ رَبِّكَ فَسۡـَٔلۡهُ مَا بَالُ ٱلنِّسۡوَةِ ٱلَّٰتِي قَطَّعۡنَ أَيۡدِيَهُنَّۚ إِنَّ رَبِّي بِكَيۡدِهِنَّ عَلِيمٞ ﴿٥٠﴾ قَالَ مَا خَطۡبُكُنَّ إِذۡ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفۡسِهِۦۚ قُلۡنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمۡنَا عَلَيۡهِ مِن سُوٓءٖۚ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفۡسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٥١﴾ ذَٰلِكَ لِيَعۡلَمَ أَنِّي لَمۡ أَخُنۡهُ بِٱلۡغَيۡبِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي كَيۡدَ ٱلۡخَآئِنِينَ ﴿٥٢﴾

﴿٤٤﴾ وتيان: ئەمە خەوێكی تێكەڵو پێكەڵەو ئێمە مانای خەوی ئاوا نازانین.

﴿٤٥﴾ جا كابرای رزگار بوی رەفیقی بەندیخانەی یوسف قسەكەی یوسفو زانیاری ئەوی پاش ماوەیەك كەوتەوە بیرو وتی: من مانای ئەو خەوەتان پێ ئەڵێم ئەویش لە لایەن رەفیقێكی بەندیخانەمەوە ئەگەر بمنێرن بۆ لای، ئەوانیش كابرایان نارد بۆ لای ئەو رەفیقەی جا كابرا چو لە بەندینخانەدا یوسف ی دۆزیەوەو وتی:

﴿٤٦﴾ یوسف ئەی دۆستەكەم ئادەی خەو پەرژێنی ئەم خەوەمان بۆ بكە كە حەوت مانگای لەرەحوت مانگای قەڵەوی خواردوە وحەوت گوڵە گەنمی وشك حەوت گوڵە گەنمی تەڕی خوارد(یان حەوت گوڵەگەنمی وشك بەرزبوەتەوە بەسەرحەوت گوڵەگەنمی تەڕدا) تا منیش برۆمەوە لای خەڵكو ماناكەیان پێ بڵێم، جا یوسف لەمانای خەوەكە تێگەیشت،

﴿٤٧﴾ وتی حەوت ساڵ یەك لە دوای یەك شت دەچێنو زەراعەتوكشتوكاڵ دەكەنو هەرزانی ئەبێ بەڵام ئەبێ ئاگاتان لە خۆبێتو لەم ماوەیەدا ئەو دەغڵو دانە زایەنەكەن بەڵكو هەرلە كاتێكدا درەوی دەكەن بەگوڵو پێڵوەوە هەڵیگرن _بۆ ئەوەی زۆر بخایەنێتو خەسارنەبێ مەگەر كەمێك بۆ ئەوەی كەبیخۆن واتە كەم بخۆنو زۆر هەڵگرن.

﴿٤٨﴾ چونكە لەدوای ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵ گرانی سەخت دێت بەسەرتاندا ئەوكاتە هەرچیتان داناوە لەپێشدا لەو حەوت ساڵە گرانیەدا دەی خۆن مەگەر كەمێ لەوەی كە هەڵی ئەگرن بۆتان بمێنێتەوە، تەنانەت ئەوەیش كە دەچێنرێت هیچ سودێكتان پێ نادات. ئینجا مژدەیشی پێدانو وتی:

﴿٤٩﴾ لەپاش ئەو ساڵانە ساڵێكی تردێت كە بارانی زۆر چاك دەبارێتو هەرزانی دێتو خەڵك لە هەمو شتێك سود وەرئەگرێتو میوەو بەری درختان زۆرئەبنو لەو ساڵەدا ئاوی میوەی زۆر دەگرن، بەم شێوە خەو پەرژێنی خەوی پاشای كرد بۆرەفیقەكەیو ئەویش هاتەوە ناو خەڵكو لای پاشاو مانای خەوەكەی بەناو یوسفەوە كەلە بەندیخانەیە بۆ پاشا باسكردو پاشایش لە جوانی خەو پەرژێنەكەی سەری سوڕما.

﴿٥٠﴾ جا پاشا گوتی: برۆن بۆم بهێنن، كابراش هات بەشوێن یوسف داو وتی: پاشا بانگی كردویت بۆ لای خۆی، بەڵام یوسف پەلەی نەكرد بۆ هاتنە دەرەوە بەڵكو بە كابرای وت: بگەڕێرەوە بۆلای پاشاكەت، جا پرسیاری لێ بكەبۆچیو لەسەر چی ئەو ئافرەتانە دەستی خۆیان بڕی بێگومان پەروەردگارم زۆر زانایە بەفڕوفێڵی ئەوان. واتە: یوسف ویستی پاكو خاوێنی ئەو دەركەوێتو بزانرێت كەئەم چەند ساڵەی كە بەندكراوە ناڕەوابوەو بوختێانیان بۆ كردوە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لەم بارەیەوە وەسفی یوسف دەكاتو ئەفەرموێ:{ لَوْ لَبِثْتُ ِ السجْنِ مَا لَبِثَ يُوسُفُ ثُم جَاءَ ِ الداعِي لَأَجْبتُ / حسنه الالبا / واتە ئەگەر من بەو ئەندازەی كە یوسف لە بەندیخانەدابو بمایەمەوە پاشان بانگیان بكردمایە وەڵامی ئەو بانگ كەرەم ئەدایەوەولە بەندیخانە ئەهاتمە دەرەوەوداوای پاكانە كردنم نەدەكرد}

﴿٥١﴾ ئاشكرایە پاشا زۆر گرنگی بەم ئیشە داو ئافرەتەكانی كۆكردەوەو وتی: راستی خۆتانم پێ بڵێنو چۆنو چییتان كرد كاتێ كە داوای ئەو كارەتان لە یوسف كردو ئەو چی كرد لەگەڵ ئێوەدا وتیان: پەنا ئەگرین بەخوا لەوەی كە بختیانی بۆ بكەین بێگومان ئێمە لەو كابرایە هیچ خراپەیەكمان نەدیوە، جا بەم شێوەیە بێگومان پاك داوێنی یوسف لە مانگی چواردە رۆشنتربویەوە، هەر بۆیە زۆر بەزوی خێزانی عەزیزی میسر وتی: بێگومان ئێستا حەق دەركەوتو ناشارێتەوە، من داوام لە

ئەوکرد کە ئیشی خراپم لەگەڵدا بکات وبێگومان ئەو لە راستگۆیانە.

(٥٢) ئەو بێنەوبەرەیەکرا تا پاشا بزانێ کە من لە پەنامەکی دا هیچ خیانەتێکم پێ نەکردوەو بێگومان ﷲ خیانەتی خیانەتکاران ئاشکرا دەکاتو نایەڵێت لە ژێر پەردەدا بمێنێتەوە.

(٥٣) ئەوسا من خۆم بەبێوەری نازانم لە تاوان بەڵام لەم بارەوە بوختانم پێکراوەو بەناڕەوا بەند کراوم، جا بۆیە نامەوێ پاکانەی هەمو تاوانێك لە خۆم بکەم چونکە بێگومان کە نەفس بەزۆری فەرمانی خراپ بەمرۆڤ دەکات مەگەر کەسێك پەروەردگارم بەزەیی پێدا هاتبێتەوەو لە خراپەی نەفسی پارێزگاری کردبێت بێگومان پەروەردگارم زۆر چاو پۆشیکارەو بەسۆزە بۆ بەندەکانی. ئا بەم شێوەیە یوسف پاكو خاوێنی خۆی دەرخستو وانەیەکی زۆر بەنرخیشی بەمرۆڤەکانی پاش خۆی وتەوە کە چۆن خۆگرو لەسەر خۆو ئارام بن لەکاتی روبەڕوبونەوە لەگەڵ ئەو بارو دۆخە ناهەموارانەی کە دێتە رێگایو هەرچەن کە پاكو خاوێن بێ بەڵام نابێ کەم تەرخەم بێ سەبارەت بە فەرمانەکانی پشت پەردەو نابێ هێمن بێ لە مەکری خوا هەروەکو چۆن نابێ مەئیوسو نائومێدیش بێت، وەنابێ لە سەرکەشی نەفسی کەمتەرخەم بێو هەمیشە خۆی وەکو بەفری بێ پەڵە بزانێ بێگومان ئەگەر تەماشای ئەم چیرۆکەی یوسف بکەینو هەوڵدەین کە سودەکانی بنوسین زەمانێکی زۆری ئەوێ جامن هەوڵ ئەدەم شتێکی کەمی لێ باس بکەم باقی بەجێ بێڵم بۆ خوێنەرانی ئازیز، هەندێك ئەڵێن ئەم قسانە لە﴿ ٱلۡـَٰٔنَ حَصۡحَصَ ٱلۡحَقُّ إِنَّ... ﴾ تاکو ﴿ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٥٣) ﴾قسەی زلیخایە ئەویش هەرهەمان مەبەست ئەگەیەنێ والله اعلم. ئینجا پاش ئەم رۆشن بونەوە گرنگە.

(٥٤) پاشا وتی: بیهێنن بۆم من بەتایبەت ئەوم بۆ خۆم دەوێت ئینجا رۆیشتنو هێنایان، جا کاتێك کە قسەی لەگەڵدا کرد زیاتر لێ هاتویو پاکییە تێکەی بۆرونتربویەوەو وتی: ئەمڕۆ تۆ لەلای ئێمە مرۆڤێکی جێگادارو ئەمینی وبەهەڵس وکەوت وزانایی‌و دانایت جێگای خۆتت لەدڵی ئێمەدا کردوەتەوە، ئینجا یوسف بۆ راگەیاندنی بیرو راکەی خۆی ئەم قسەیەی بەهەل زانی،

(٥٥) وتی: دام بنێ لەسەر خەزێنەی ئەم وڵاتەدا واتە بمکە بەسەرپەرشتو لێ پرسراوی دارای میسر بێگومان من زۆر پارێزەری ئەو سەروەتو سامانەمو زۆر چاك ئەزانم چۆن پەرەی

﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفۡسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفۡسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٥٣) وَقَالَ ٱلۡمَلِكُ ٱئۡتُونِي بِهِۦٓ أَسۡتَخۡلِصۡهُ لِنَفۡسِيۖ فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ قَالَ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ (٥٤) قَالَ ٱجۡعَلۡنِي عَلَىٰ خَزَآئِنِ ٱلۡأَرۡضِۖ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٞ (٥٥) وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ نُصِيبُ بِرَحۡمَتِنَا مَن نَّشَآءُۖ وَلَا نُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ (٥٦) وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ (٥٧) وَجَآءَ إِخۡوَةُ يُوسُفَ فَدَخَلُواْ عَلَيۡهِ فَعَرَفَهُمۡ وَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ (٥٨) وَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمۡ قَالَ ٱئۡتُونِي بِأَخٖ لَّكُم مِّنۡ أَبِيكُمۡۚ أَلَا تَرَوۡنَ أَنِّيٓ أُوفِي ٱلۡكَيۡلَ وَأَنَا۠ خَيۡرُ ٱلۡمُنزِلِينَ (٥٩) فَإِن لَّمۡ تَأۡتُونِي بِهِۦ فَلَا كَيۡلَ لَكُمۡ عِندِي وَلَا تَقۡرَبُونِ (٦٠) قَالُواْ سَنُرَٰوِدُ عَنۡهُ أَبَاهُ وَإِنَّا لَفَٰعِلُونَ (٦١) وَقَالَ لِفِتۡيَٰنِهِ ٱجۡعَلُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ فِي رِحَالِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَعۡرِفُونَهَآ إِذَا ٱنقَلَبُوٓاْ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ (٦٢) فَلَمَّا رَجَعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيهِمۡ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مُنِعَ مِنَّا ٱلۡكَيۡلُ فَأَرۡسِلۡ مَعَنَآ أَخَانَا نَكۡتَلۡ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ (٦٣) ﴾

پێ بدەمو چۆنی دابەش بکەمو ساڵانی هەرزانی چی بکەم بۆ ساڵانی گرانی کەدێت، بەڵێ پاشایش وەکو لە پێشەوە پەنجەمان بۆ خشاند موسڵمان بو وسەرپەرشتیو لێ پرسراوی دارای دایە دەست یوسف. بەڵێ ئا بەم شێوەیە یوسفی ناو زیندان بو بەگەورەو ناوداری میسر، یوسفی ئاوارەو فرۆشراو بختیان بۆ کراو بو بەناسراوترینو پاكو خاوێن ترینو بەدەسەڵاتترینی خەڵکی میسر بەراستی هەر خوایە زاناو داناو ئەزانێ چۆن بارو دۆخی مرۆڤ بگۆڕێتو چۆنی بپارێزێتو چۆن سەقامگیری بکات، بەڵێ راست ئەفەرموێ:

(٥٦) هەر ئاوەها ئێمە یوسفمان پایەدارو جێگیر کرد لەسەر زەویدا ئەوسا ژیانی لەچوارچێوەی دیواری زینداندا بو، وا ئێستا لەهەر جێگایەکی میسردا کە خۆی ئارەزۆ لێ بێ دائەنیشێت، بەم شێوە داستانەکە دێنێتە بەرچاومانو ئەفەرموێ (يَتَبَوَّأُ _نەك_ تَبَوَّأَ] ئینجا ئەفەرموێ: ئێمە هەر ئاوەها رەحمەتی خۆمان ئەدەین بەو کەسەی کە ئارەزۆمان لێ بێتو ئێمە پاداشی چاکەکاران نافەوتێنین لە دنیادا.

(٥٧) خۆ پاداشتی رۆژی دوایی چاکترە لەو پاداشەی دنیایان بۆ ئەو کەسانەی کەلە خواترسنو بەئیشی چاكو بەندایەتی پاك خۆیان لە سزای خوا ئەپارێزن. بەڵێ: ساڵەگرانی دەستی پێکردو هەمو وڵاتی گرتەوەو یەعقوبیش کوڕەکانی نارد بۆ هێنانی

قَالَ هَلۡ ءَامَنُكُمۡ عَلَيۡهِ إِلَّا كَمَآ أَمِنتُكُمۡ عَلَىٰٓ أَخِيهِ مِن قَبۡلُۖ فَٱللَّهُ خَيۡرٌ حَٰفِظٗاۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٦٤﴾ وَلَمَّا فَتَحُواْ مَتَٰعَهُمۡ وَجَدُواْ بِضَٰعَتَهُمۡ رُدَّتۡ إِلَيۡهِمۡۖ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا مَا نَبۡغِيۖ هَٰذِهِۦ بِضَٰعَتُنَا رُدَّتۡ إِلَيۡنَاۖ وَنَمِيرُ أَهۡلَنَا وَنَحۡفَظُ أَخَانَا وَنَزۡدَادُ كَيۡلَ بَعِيرٖۖ ذَٰلِكَ كَيۡلٞ يَسِيرٞ ﴿٦٥﴾ قَالَ لَنۡ أُرۡسِلَهُۥ مَعَكُمۡ حَتَّىٰ تُؤۡتُونِ مَوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ لَتَأۡتُنَّنِي بِهِۦٓ إِلَّآ أَن يُحَاطَ بِكُمۡۖ فَلَمَّآ ءَاتَوۡهُ مَوۡثِقَهُمۡ قَالَ ٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ﴿٦٧﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ مِنۡ حَيۡثُ أَمَرَهُمۡ أَبُوهُم مَّا كَانَ يُغۡنِي عَنۡهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍ إِلَّا حَاجَةٗ فِي نَفۡسِ يَعۡقُوبَ قَضَىٰهَاۚ وَإِنَّهُۥ لَذُو عِلۡمٖ لِّمَا عَلَّمۡنَٰهُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦٨﴾ وَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَخَاهُۖ قَالَ إِنِّيٓ أَنَا۠ أَخُوكَ فَلَا تَبۡتَئِسۡ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٦٩﴾

دەغڵو دانو ناوی یوسفیش وەکو پاشایەکی بەرەحمو بەخشندەی میسری کەوتە ناو خەڵکەوە.

﴿٥٨﴾ جا ئەو برایانەی یوسفیش هاتن بۆ لای بۆ ئەوەی یارمەتیان بدات، جا ئەو ئەوانی ناسیەوە بەڵام ئەوان ئەوییان نەناسیەوە، چونکە لە کاتی خۆی ئەو ئەوانی دیبو گەورە بوونو شتێکی وانە گۆڕابون بەڵام یوسف منداڵ بو باوەڕیشیان نەدەکرد کە ئەو هیچ کات بگاتە پلەو پایەکی ئەوندە گەورەو بەناوبانگ، جا یوسف حەزی لە گەڕانەوەی ئەوان بو لەبەر ئەوە،

﴿٥٩﴾ کاتێك ئەوەی کە بۆی هاتبون پێی دانو ئامادەی کردن، وتی: ئەو برا باوکیەتانم بۆ بێرن مەگەر ئێو خۆتان نابینن کەمن پێوانەی تەواوتان بۆ دەکەم؟ ئەگەر چی ئێوە پارەی کەمتان پێیە، وە ئایا ئێوە نابینن کە باشترین کەسم لەو کەسانەی کە ئێوە چونەتە لایو چاکترین خواردن ئەدەم بەمیوان واتە: دڵنیابن کەمن مەبەستی خراپم نیە لە داواکردنی برا باوکیەکەتان، ئەڵێن یوسف کاتێ ناسینی پرسیاری زۆری لێ کردون لەوانە کە ئێوە خەڵکی کوێنو کوڕی کێنو چەند بران؟ ئەوانیش وتیان کە ئێمە خەڵکی کەنعانینو کوڕی یەعقوب پێغەمبەرینو دوانزە برابوین دەمان باوکو دایکیینو ئێستە لێرەینو برایەکی باوکیمان لە ماڵدایەو یەکێك لە برا دایکیەکەمان نەماوە جا بۆیە ئەوویش حەزی کرد کە برا باوکو دایکیەکەی خۆی پێشەکی ببینێت بۆیە ئەوداوایەی لێ کردنو وتی:

﴿٦٠﴾ ئەگەر ئەو برایەتان نەهێنن لەگەڵ خۆتان دا بزانن کە ئیتر لە لای من هیچ شتێك بۆ ئێوە پێوانە ناکرێتو پێتان نافرۆشرێت، ئەوسا نزیکیشم مەبنەوە.

﴿٦١﴾ وتیان: بەم زوانە قسە لەگەڵ باوکیا دەکەینو زۆر هەوڵ ئەدەینو بێگومانبە کەئێمە بۆئەم داخوازیەی تۆ بەگوێرەی توانای خۆمان هەوڵی بۆ ئەدەین. جا یوسف بۆ ئەوەی کەئەوان زیاتر سوربن لە سەر گەڕانەوە،

﴿٦٢﴾ لەو کاتەدا بە کۆمەڵە گەنجێك کە خەریکی رێکخستنی بارەکانیان بون وتی: ئەو کەلو پەلانەی هێناویانە بۆ کڕینی خۆراك بیخەنەوە ناو بارەکانیانەوە تائەوان هەرکاتێ گەڕانەوەبۆ ناو خاو خێزانی خۆیان ئەو کەلو پەلەی خۆیان بناسنەوەو وراستیو دڵسۆزی پاشای میسریان بۆ ئاشکرا ببێو بەم هۆیەوە بتوانن باوکیان رازی بکەن کە برا باوکیە کەیان لە گەڵدا بنێرێ بەڵکو هەموویان جارێکی تربگەڕێنەوە بۆ میسر.

﴿٦٣﴾ جا کاتێك کە گەڕانەوە بۆلای باوکیان وتیان: ئەی باوکی خۆشەویستمان بێگومان ئێمە ئیتر شتمان پێ نادرێت مەگەر براکەی ترمان لەگەڵدا بنێری بۆ سەفەر، جا کەوابو داوات لێ دەکەین کە ئەو برایەشمان لە گەڵدا بنێرە ئێمە پێوانەی خۆمان بەتەواوی وەر ئەگرینو بێگومان ئێمە چاودێری دەکەینو نایەڵین هیچی بەسەربێ.

﴿٦٤﴾ ئینجا یەعقوب وتی: ئایا دڵنیابم لێتان سەبارەت بەو مەگەر هەر بەو شێوەی کە دڵنیا بووم لێتان سەبارەت بە براکەی لەپێشدا؟ واتە پاش ئەوەی کە ئێوە ئاواتان کرد بە یوسفی برای ئیتر چۆن دڵنیا بم لێتان سەبارەت بەمیشو من جارێك گەزراووم، هەرچەندە کە من دڵنیام کە خوا چاودێریکی زۆر چاکەو ئەو لە هەمو خاوەن سۆزو بەرەحمەکان بەسۆزو بەرەحم ترە، جا گفتی پێ نەدان کەئەو برایەیان پێ بدات.

﴿٦٥﴾ بەڵام کاتێك کە کەل وپەلیان کردەوە سەیریان کرد ئەو کەل وپەلانەی کە بردویانە بیدەن بەحەقی خۆراك هەموی لەناو بارەکانیاندایەو بۆیان گەڕاندونەتەوە، جا بەخۆشحاڵیەوە وتیان: ئەی باوکی بەرێزمان ئێمە لەوە زیاتر چیمان دەوێت تەماشاکە لەگەڵ هێنانی ئەو هەمو خۆراکەدا ئەمە کەلو پەلەکەمانە کەهەموویمان بۆگەڕێنراوەتەوە، جا ئەگەر تۆ براکەمان لەگەڵدا رەوانەبکەیت لەگەل خۆماندا ئەیبەینو خۆراکی زیاتر ئەهێنین

فَلَمَّا جَهَّزَهُم بِجَهَازِهِمْ جَعَلَ ٱلسِّقَايَةَ فِى رَحْلِ أَخِيهِ ثُمَّ أَذَّنَ مُؤَذِّنٌ أَيَّتُهَا ٱلْعِيرُ إِنَّكُمْ لَسَٰرِقُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ وَأَقْبَلُوا۟ عَلَيْهِم مَّاذَا تَفْقِدُونَ ﴿٧١﴾ قَالُوا۟ نَفْقِدُ صُوَاعَ ٱلْمَلِكِ وَلِمَن جَآءَ بِهِۦ حِمْلُ بَعِيرٍ وَأَنَا۠ بِهِۦ زَعِيمٌ ﴿٧٢﴾ قَالُوا۟ تَٱللَّهِ لَقَدْ عَلِمْتُم مَّا جِئْنَا لِنُفْسِدَ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كُنَّا سَٰرِقِينَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ فَمَا جَزَٰٓؤُهُۥٓ إِن كُنتُمْ كَٰذِبِينَ ﴿٧٤﴾ قَالُوا۟ جَزَٰٓؤُهُۥ مَن وُجِدَ فِى رَحْلِهِۦ فَهُوَ جَزَٰٓؤُهُۥ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٥﴾ فَبَدَأَ بِأَوْعِيَتِهِمْ قَبْلَ وِعَآءِ أَخِيهِ ثُمَّ ٱسْتَخْرَجَهَا مِن وِعَآءِ أَخِيهِ ۚ كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ ۖ مَا كَانَ لِيَأْخُذَ أَخَاهُ فِى دِينِ ٱلْمَلِكِ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ نَرْفَعُ دَرَجَٰتٍ مَّن نَّشَآءُ ۗ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ۞ قَالُوٓا۟ إِن يَسْرِقْ فَقَدْ سَرَقَ أَخٌ لَّهُۥ مِن قَبْلُ ۚ فَأَسَرَّهَا يُوسُفُ فِى نَفْسِهِۦ وَلَمْ يُبْدِهَا لَهُمْ ۚ قَالَ أَنتُمْ شَرٌّ مَّكَانًا ۖ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَصِفُونَ ﴿٧٧﴾ قَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾

بۆ خاو خێزانمانو چاودێری براکەمان دەکەین، خۆ ئێمە باری وشترێك زیاتر ئەهێنین چونکە هەرکەسێك بارێکی پێ ئەدرێ، ئەوە پێوانەیەکی کەمەو ئاسانە لە لای ئەو پاشایە مادام ئەو بێت لەگەڵماندا بارێك زیاتر ئەهێنین، جا هەر بەگەڕانەوەی نرخی کەل وپەلە خۆراکیەکان ئەبێت دڵنیا بیت کە ئەو پاشایە نیەتی خراپی نیە لەگەڵماندا.

﴿٦٦﴾ وتی: ئەو نانێرم لەگەڵتاندا هەتا پەیمانێکی زۆر بتەوم پێ نەدەنو سوێندم بۆ نەخۆن بە خودا کە ئێوە بیهێننەوە لەگەڵ خۆتاندا مەگەر بەڵایەك بێتو هەموتان بگرێتەوە، ئەوانیش بەڵێنیان بەباوکیان دا کە بەباشی چاودێری ئەو برایانە بکەنو باوکیشیان بەو سەفەرەی کوڕەکەی(بنیامین) لەگەڵیاندا ڕازی بو، جا کاتێك کەئەوان پەیمانیان دا بەو، وتی: خوا چاودێرو شایەتە لەسەر ئەوەی کە ئەیڵێن. ئینجا کەوتە ئامۆژگاری کردنیان،

﴿٦٧﴾ وتی: ئەی کوڕەکانم کاتێ چونە شار لەیەك دەرگاوە مەچنە ناوەوە بەڵکو بەش بەش ببنو لە چەند دەرگایەکی جیاجیاوە بچنە ژورەوە، یەعقوب بەو شێوە ویستی کوڕەکانی لە چاوی پیس بپارێزێو وتی: خۆ من بەم ئامۆژگاریەم ناتوانم هیچ زیانێك لەسەر ئێوە لابەرم ئەگەر خودا خۆی ئارەزۆی لێ بێت واتە: خۆپاراستن قەدەری خوا ناگەڕێنێتەوە، چونکە هیچ بڕیارو حوکمێك نادرێو ناکرێ مەگەر خودا خۆی بیکات لەبەرئەوە تەنها پشت بەو دەبەستم، وە تەنها با ئەو بکەن بەپشتو پەنای خۆیان ئەوانەی کە پشتو پەنایان دەوێ، بەڵێ یەعقوب بەم شێوەیە ویستی لە چاوی چاوپیسان دوریان بخاتەوە، چونکە چاوپیس وەکو چەکی لەسەر پێ وایەو هەر کە قسە هات بەدەمیا ئەو تیرە دەر ئەچێتو نیشانە ئەپێکێت _بە ئارەزۆ خوا_وەپێغەمبەرمان هیمای بۆ ئەو چاوانە کردوەو چەندین فەرمودەی لەو بارەوە فەرموە یەکێك لەوانە {الْعَيْنُ حَق/ منفق عليه/ چاوی پیس ڕاستە دەپێکێت}

هەروەها ئەڵێن: سەهلی کوڕی حونەیف لە کەنار ـ ئاوێکەلە مەدینە ـ لیباسی لەبەرکەندو خۆی شۆرد عامیری کوڕی ڕەبیعە تەماشای کرد، سەهل پیاوێکی سپی پێستو جوان بو وتی: هەرگیز وەکو ئەمڕۆ پێستێکی شاراوەی ئەوەندە جوانم نەدیوە کتوپڕ سەهل تایەکی توند دای گرت جا هەواڵی نەخۆشی سەهل بە پێغەمبەر ﷺ ڕاگەیەنراو وترا ناتوانێ لەگەڵتابێت ئەی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا هاتو سەهل بەسەر هاتی خۆیو عامیری بۆ باسکرد، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{ عَلَامَ يَقْتُلُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ؟ أَلا بَرَّكْتَ، اغْتَسِلْ لَهُ ». فَغَسَلَ عَامِرٌ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ، وَمِرْفَقَيْهِ وَرُكْبَتَيْهِ، وَأَطْرَافَ رِجْلَيْهِ، وَدَاخِلَةَ إِزَارِهِ فِي قَدَحٍ، ثُمَّ صُبَّ عَلَيْهِ، فَرَاحَ سَهْلٌ مَعَ النَّاسِ لَيْسَ بِهِ بَأْسٌ / مؤطا، النسائي، صححه الالبا / لەسەر چی ئێوە برای خۆتان دەکوژن بۆ ئەو کاتە موبارك بایت لێ نەکرد ـ بارك الله ـ خۆت بشۆرە بۆی ئەڵێن: عامیر دەمو چاوو دەستیو ئەنیشکەکانیو هەردوو ئەژنۆیو شەرمگەیو هەردو قاچی شۆردنە ناو کاسەیەکەوەو لە پاشا ئەو ئاوە ڕژێنرا بەسەری سەهل داو دەمو دەست چاك بویەوە وەك ئەوەی کە هەرگیز نەخۆش نەبوبێتو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ڕۆیشتن}

جا کوڕانی یەعقوب ڕۆیشتن وکاتێ گەیشتنە میسر ئابەو شێوەی کەباوکیان فەرمانی پێدان چونە شارەوە،

﴿٦٨﴾ جا لە کاتێکا کە چونە شارەوە لەو شوێنانەوە کە باوکیان دەستوری پێدا بون کە ئەو چونە شارە بەو شێوەیە نەبو بەهۆی ئەوەی کە ئەوان بپارێزێ لەوەی کە خوا ئەیویست بۆیان بەڵکو ئەمەتەنها نیازێکی ناو دڵی یەعقوبی باوکیان بو کەبەو شێوەیە جێ بەجێی کرد، بێگومان ئەو خاوەنی زانیارییەك بو بۆ ئەو شتەی کە ئێمە فێرمان کردبو لە بەرنامەی ئایینو خودا ناسیو ئیشی پێ دەکرد بەڵام زۆربەی خەڵك ئەوەیان نەدەزانی، ئەگونجێ مەبەست ئەوەبێ کە خوا یەعقوبی تێگەیاندبێ کە یوسف ماوەو پەیدا ئەبێتەوە بەڵام خەڵکی تر ئەوەیان نەئەزانی.

﴿٦٩﴾ جا لە کاتێکدا کە چونە لای یوسف براکەی بەشێوەیەکی نهێنی بردە لای خۆیو پێی وت: دڵنیابە کەمن برای تۆم، هیچ

دڵت نەترسێ، ئەمەوێ تۆ لای من بمێنێیتەوەو فێڵێك لەوان بكەم كە جارێ نەم ناسنەوە جا تۆ لەوەی كە پیاوانی مەئمور لەگەڵتا دەكەن نائومێد مەبە. بەڵێ یوسف نە خشەی كاری گلدانەوەی بنیامینی ئابەم شێوەیەبۆكێشان.

(٧٠) جا لە كاتێكا كە مەئموری دەغڵو دانفرۆش كەلو پەلیان ئامادە كرد لەو كاتەدا كاسەی ئاوخواری خۆی یان مەن پێوانەی بەشێوەیەكی نهێنی خۆی یان كەسێكی نزیكی خۆی خستیە ناو باری براكەیەوەو لەپاش كەوتنە رێگا جاڕچییەك جاڕی داو وتی: ئەی قافڵە مەچن بێگومان ئێوە دزن.

(٧١) لە حاڵێكدا كە رویان تێكردن‌وتیان: چیتان لێ ون بووە؟

(٧٢) وتیان: كاسەی پاشامان لێ ون بووەو هەر كەسێك بیهێنێتەوە یەك باری وشتر خۆراكی پێ ئەدرێتو من خۆم كەفیلی ئەومە كە ئەو بارە وشترەی پێ بدەم لێرەدا چەند حوكم هەیە لەوانە

١-دانانی شت بۆ كەسێك كە شتێكی گوم بو بدۆزێتەوە(الجعالە).

٢-دروستە كەسێك ببێ بەزامن‌و كەفیلی كەسێكی تر(الكفالە)

٣-ئەگەر كەسێك لەناو كۆمەڵێكدا خراپەیەكی كرد مادام كابرای خراپەكار دیارنەبێ دروستە بەهەمویان بڵێیت خراپەكارن(انكم لسارقون/ بێگومان ئێوە دزن) بەڵام چونكە ئەوان لەمبارەوە هیچیان نەئەزانیو خۆیان بەبێ تاوان ئەزانی زوو هاتنە وەڵام ،

(٧٣) وتیان: بەخوا ئێوە باش ئەزانن كە ئێمە نەهاتوین بۆ ئەوەی خراپە بكەین لەم شوێنەداو ئێمە دزنین، جا ئەوانیش.

(٧٤) وتیان: باشە سزای ئەو كەسە چی بێت ئەگەر ئێوە درۆ بكەن‌و ئەو كاسەتان دزی بێ؟

(٧٥) وتیان: سزای ئەوكەسەی كە ئەو كاسەیەی لە ناو بارەكەیدا پەیدا ببێت كردن بەبەندەیەتی هەر ئەوە سزایەتی لەیاسای ئێمەدا هەرئاوەها تۆڵە لە ستەمكاران وەردەگرین، واتە: لەشەریعەتی ئیبراهیم دا بەند كردن سزای دز بوە ئەوانە بەو شێوە قسەیان كرد چونكە دڵنیابون كە هیچكامیان ئەو كاسەیەی نەدزیوە.

(٧٦) جا كابرای مەئمور دەستی كرد بەبشكنینی بارەكانی تر بەرلەوەی دەست بكات بەبشكنینی باری براكەی بۆ ئەوەی گومان نەبرێت كە ئەمە فێڵ بوە لە پاشان لە باری براكەی دەری هێناو بەدز ناسرا. جا خوا ئەفەرموێ: هەر ئاوەها ئیشمان بۆ یوسف كرد بۆ ئەوەی لەو رێگاوە بێ ترس‌و بێ قسەی براكانی تری (بنیامین)ی برای تاماوەیەك لەلای خۆی گل بداتەوەو ئەوانیش هێشتا نەیناسنەوە، جا ئەو بنیامین ی برای خۆی بەگوێرەی یاسای پاشای میسر سزانەدا، بەڵكو ویستی پێشەكی براكانی ئامادەی ئەنجامدانی شەریعەتی یەعقوب ببن چونكە ئەو یاسای یەعقوبی لەو بارەوە ئەزانی بۆیە خوای زانا وەسفی دەكاتو ئەفەرموێ: ئێمە بەرز دەكەینەوە پلەی هەر كەسێك كە ئارەزۆمان لێ بێت، وەلە سەر هەمو زانایەكەوە زاناتر هەیە لەسەر هەموانەوە (اللّٰه)یە جل جلالە، بەڵێ، كاتی خۆی ئەوان یوسفیان دوچاری ئەو هەمو نارەحەتیو ئاوارەیو دەردە سەرییەكرد بەڵام ئەو بەم كەمە دڵتەنگیەی ئەوان وازی هێنا. جا ئیتر ئەوان هیچیان بۆ نەمایەوە دەستیان كرد بەپاكانەكردنی خۆیان،

(٧٧) وتیان: ئەگەر ئەو ئەمرۆ دزی كردوە بێگومان لە پێشەوە برایەكی هەبووە دزی كردوەو ئەمیش ئەو رەووشتەی ئەوی هەڵگرتوە گوایە ئەڵێن: یوسف بەدزیەوە خواردنی ئەدا بەفەقیران‌و لەم بارەوە چەندین قسەی تر كراوە زۆر جێگای باوەڕنیە، هەرچی بو بێت چ چاكی كردبێ وەكو ئەوەی پێشو یان بتی دزی بێ‌و شكاندبێتی یان بەروالەت چاك نەبێ ئەو لەو كاتەدا پێش بالغبون‌و پێش پێغەمبەرایەتی بوەو جێگای لۆمەو سەرزەنش نیە بەڵام خۆئەوان هەمویان پیاوی گەورە بون ئەو هەمو ئێش‌و ئازارەیان بۆ یوسف دروستكردو ئێستاش خۆیان بەچاك پیشان ئەدەن؟!

وتراوە "هەركەس بەتەنیا بچێتەلای قازی ئەگەرێتەوە بەرازی" چونكە كەس نیە بەرپەرچی بداتەوە، ئێستا ئەوان ئاوا بە یوسف ئەڵێن‌و بێ ئاگان لەوەی كەئەمە یوسفی بوختانیان بۆكراوە؟! بەڵام یوسف زۆر بەچاكی دانی بە خۆی داگرتو خۆی ئاشكرا نەكرد وەك خودا دەفەرموێت: یوسف ئەم روداوەی لە ناو دڵی خۆی شاردەوەو ئاشكرای نەكرد بۆیان تا هەست بەهیچ نەكەن‌و بەنهێنی وتی: بێگومان ئێوە جێگاتان خراپتر بو. ئینجا بەئاشكرا وتی: هەر خوا زانایە بەو وەسفەی كە بۆ برای بنیامینی دەكەن، بەڵێ ئەوان پاش ئەوقسەیەش كەكردیان چونكە دڵتەنگی باوكیان

زۆر بەلاوە گرنگ بو هەستان بەپاڕانەوە لە یوسف بەلکو دڵی نەرم بێو بنیامینیان پێ بداتەوە.

(٧٨) وتیان: ئەی عەزیز بێگومان ئەو باوکێکی پیرو گەورەی هەیە جا تۆ بفەرموە پیاوەتێك لەگەڵ ئێمەدا بکەو یەکێك لە ئێمە لە شوێنی ئەودا وەر بگرە بێگومان ئێمە تۆ بە پیاوێك لە چاکەکاران ئەزانینو ئەم چاکەمان لەگەڵدا بکە. یوسف وەڵامی دانەوە.

(٧٩) وتی: پەنا ئەگرم بە ﷲ لەوەی کە ئێمە هیچ کەسێك بگرین بێجگە لەو کەسەی کە ئەو کەلو پەلەی خۆمانمان لەلای دەستکەوتوەتەوە، ئەگەر ئێمە بەقسەی ئێوە بکەین بێگومان ئێمە لە ستەمکارانین، واتە: تاوانو ستەمە، کەسێکی بێ تاوان لە باتی کەسێکی تاوانباردا سزا بدرێت، بەڵێ قسەو گفتوگۆیان هیچ بەرهەمێکی نەبو ئە فەرموێ:

(٨٠) جا لە کاتێکدا بێ هیوا بون لە یوسف ئینجا دورکەوتنەوەو دەستیان کرد بەچپەکردن لە نێوان خۆیاندا گەورەکەیان وتی: ئایا کە ئێوە نازانن کە باوکتان سوێندو پەیمانی لە ئێوە وەرگرتوە کە بنیامین بینەوە، خۆ بەرلەمەیش ئایا ئێوە نازانن دەربارەی یوسف چەند کۆتاییتان کرد؟ وە هیچتان بەگوێ نەکرد ئیتر من لێرە دەرناچم مەگەر باوکم ماوەم پێ بدات یان مەگەر خوا بڕیاری شتێکم بەسەرا بدات وەهەر ئەوە چاکترین حاکمانو بەفەرمانی ئەو ڕازیمو لێرە ئەمێنمەوە،

(٨١) ئێوە بگەڕێنەوە بۆ لای باوکتان ئەوسا بڵێن ئەی باوکی خۆشەویستمان بێگومان کە کوڕەکەت دزی کردوەو ئێمە شایەتی نادەین مەگەر لەسەر شتێك کە خۆمان زانیومانەو بەچاوی خۆمان دیومانە، خۆ ئێمە شتەنهێنیەکانمان نەئەزانی واتە کاتێ ئەو بەڵێنەمان بەتۆدا نەمان ئەزانی ئەم کوڕە دزی دەکاتو دوچاری ئەودەردی سەرییە ئەبین، وەنەشمان زانی کە ئەو دزی کردوە تا ئێمە قسە نەکەینو لە پاشا جەریمەمان بدایەو بمانهێنایەوە.

(٨٢) برا گەورەکەیان پێی وتن: بڕۆنەوەو ئەم هەواڵە بەباوکتان ڕاگەیەنن، جا ئەگەر گومانی لێ کردن بڵێن: با پرسیار بکات لە خەڵکی ئەو جێگایەی کە ئێمەی تێدابوەو پرسیار بکات لەو قافڵەیەی کەئێمەی لەگەڵدابوە، جا بێگومان بێت کەئێمە لە ڕاستگۆیانین. بەڵێ قافڵە گەیشتەوە کەنعانو کوڕانی یەعقوب بە

قَالَ مَعَاذَ ٱللَّهِ أَن نَّأۡخُذَ إِلَّا مَن وَجَدۡنَا مَتَٰعَنَا عِندَهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّظَٰلِمُونَ (٧٩) فَلَمَّا ٱسۡتَيۡـَٔسُواْ مِنۡهُ خَلَصُواْ نَجِيّٗاۖ قَالَ كَبِيرُهُمۡ أَلَمۡ تَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ أَبَاكُمۡ قَدۡ أَخَذَ عَلَيۡكُم مَّوۡثِقٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَمِن قَبۡلُ مَا فَرَّطتُمۡ فِي يُوسُفَۖ فَلَنۡ أَبۡرَحَ ٱلۡأَرۡضَ حَتَّىٰ يَأۡذَنَ لِيٓ أَبِيٓ أَوۡ يَحۡكُمَ ٱللَّهُ لِيۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ (٨٠) ٱرۡجِعُوٓاْ إِلَىٰٓ أَبِيكُمۡ فَقُولُواْ يَٰٓأَبَانَآ إِنَّ ٱبۡنَكَ سَرَقَ وَمَا شَهِدۡنَآ إِلَّا بِمَا عَلِمۡنَا وَمَا كُنَّا لِلۡغَيۡبِ حَٰفِظِينَ (٨١) وَسۡـَٔلِ ٱلۡقَرۡيَةَ ٱلَّتِي كُنَّا فِيهَا وَٱلۡعِيرَ ٱلَّتِيٓ أَقۡبَلۡنَا فِيهَاۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ (٨٢) قَالَ بَلۡ سَوَّلَتۡ لَكُمۡ أَنفُسُكُمۡ أَمۡرٗاۖ فَصَبۡرٞ جَمِيلٌۖ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَنِي بِهِمۡ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ (٨٣) وَتَوَلَّىٰ عَنۡهُمۡ وَقَالَ يَٰٓأَسَفَىٰ عَلَىٰ يُوسُفَ وَٱبۡيَضَّتۡ عَيۡنَاهُ مِنَ ٱلۡحُزۡنِ فَهُوَ كَظِيمٞ (٨٤) قَالُواْ تَٱللَّهِ تَفۡتَؤُاْ تَذۡكُرُ يُوسُفَ حَتَّىٰ تَكُونَ حَرَضًا أَوۡ تَكُونَ مِنَ ٱلۡهَٰلِكِينَ (٨٥) قَالَ إِنَّمَآ أَشۡكُواْ بَثِّي وَحُزۡنِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ (٨٦)

دڵێکی پڕ لە داخو خەفەتەوە هاتنەوە لای باوکیان کە نۆ کەس بونو ڕوداوەکەیان بەوشێوەی سەرەوە بۆ باکیان باسکرد بەڵام ئەو باوەڕی پێ نەکردن.

(٨٣) نەخێر وانیە کە ئێوە دەڵێن بەڵکو نەفستان شتێکی خراپی بۆ جوان کردوون ئەوسا هەر چۆنیش ببێت من هەر خۆ ئەگرمو هیچ شتێکی خراپتان پێ ناڵێم نزیکە خوا هەمویانم بۆ بهێنێتەوە بێگومان خوا زانەری بارو دۆخی ناو دڵی منەو دانایەو هەمو ئیشەکانی پڕە لە سودوو خەیرو بەرەکەت، واتە: یەعقوب لە ڕەحمەو سۆزی خوا بێ هیوا نەبوەو چاوەڕوانی هەمویانە لە پاش ئەم قسانە ئیتر باسی نەکردن،

(٨٤) جا پشتی تێکردنو هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی: های داخ بۆ یوسف و چاوەکانی سپی ببوونەوەلە خەفەتداو کوێر ببو و ئەو لە ناو دڵیا هەمیشە ڕقی خۆی ئەخواردەوەو هیچی ئاشکرا نەدەکرد سەبارەت بە یوسف.

(٨٥) بۆیە کوڕەکانی، وتیان: بە خوا تۆ هەر واز ناهێنیو بەردەوام باسی یوسف دەکەی هەتا تەواو پەکت دەکەوێ یان ئەمریت واتە: بۆچی ئەوەندە باسی دەکەیت تازە ئەو ڕۆیو شتی تازەتر قۆماوەلێمان؟!

يَٰبَنِيَّ ٱذۡهَبُواْ فَتَحَسَّسُواْ مِن يُوسُفَ وَأَخِيهِ وَلَا تَاْيۡـَٔسُواْ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ لَا يَاْيۡـَٔسُ مِن رَّوۡحِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٧﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَيۡهِ قَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡعَزِيزُ مَسَّنَا وَأَهۡلَنَا ٱلضُّرُّ وَجِئۡنَا بِبِضَٰعَةٖ مُّزۡجَىٰةٖ فَأَوۡفِ لَنَا ٱلۡكَيۡلَ وَتَصَدَّقۡ عَلَيۡنَآۖ إِنَّ ٱللَّهَ يَجۡزِي ٱلۡمُتَصَدِّقِينَ ﴿٨٨﴾ قَالَ هَلۡ عَلِمۡتُم مَّا فَعَلۡتُم بِيُوسُفَ وَأَخِيهِ إِذۡ أَنتُمۡ جَٰهِلُونَ ﴿٨٩﴾ قَالُوٓاْ أَءِنَّكَ لَأَنتَ يُوسُفُۖ قَالَ أَنَا۠ يُوسُفُ وَهَٰذَآ أَخِيۖ قَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَآۖ إِنَّهُۥ مَن يَتَّقِ وَيَصۡبِرۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٩٠﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ لَقَدۡ ءَاثَرَكَ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَإِن كُنَّا لَخَٰطِـِٔينَ ﴿٩١﴾ قَالَ لَا تَثۡرِيبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَۖ يَغۡفِرُ ٱللَّهُ لَكُمۡۖ وَهُوَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٩٢﴾ ٱذۡهَبُواْ بِقَمِيصِي هَٰذَا فَأَلۡقُوهُ عَلَىٰ وَجۡهِ أَبِي يَأۡتِ بَصِيرٗا وَأۡتُونِي بِأَهۡلِكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا فَصَلَتِ ٱلۡعِيرُ قَالَ أَبُوهُمۡ إِنِّي لَأَجِدُ رِيحَ يُوسُفَۖ لَوۡلَآ أَن تُفَنِّدُونِ ﴿٩٤﴾ قَالُواْ تَٱللَّهِ إِنَّكَ لَفِي ضَلَٰلِكَ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٩٥﴾

﴿٨٦﴾ فەرموی: من شکایەتی خەم‌و پەژارەی خۆم تەنها لەلای خودا دەکەم چونکە بێگومان من شتانێ ئەزانم لە لایەن خوداوە کە ئێوە نایزانن، ئینجا دەستوری بە کوڕەکانی داو وتی:

﴿٨٧﴾ ئەی کوڕانی خۆم بڕۆن بۆ میسرو لەوێشدا لەبارەی یوسف‌و براکەیدا پرسیار بکەن‌و ئەم قسانەم بەگرنگ بگرن‌و نائومێد مەبن لە ڕەحمەتی خوا بێگومان نائومێد نابێت لەڕەحمەتی خودا بێجگە لە گەلی کافر، واتە تەنها کافر نائومێد دەبێت لە ڕەحمی خودا ئیتر هیچ کەسێك نائومێد نابێت، بەڵێ براکانی یوسف لەسەر بڕیاری باوکیان گەڕانەوەبۆ میسر.

﴿٨٨﴾ جا کاتێ چونەوە بۆ لای یوسف وتیان: ئەی گەورەی میسر ئێمە خۆمان‌و خاو خێزانمان دوچاری برسێتی‌و زیانێکی زۆر بوین ولە بەر ئەو نەداری‌و نەبونییەمان هاتوین بۆلاتو کەل‌و پەلێکی کەممان هێناوە بۆ شت کڕین هیواداین کە تۆ پێوانەیەکی باشمان بۆ بکەیت‌و چاکەیشمان لەگەڵدا بکەیت بە خۆراکی زیاتر بێگومان کەخودا پاداشتی چاکەکاران دەداتەوە، جا کاتێ کە ئەم داوایان لێ کرد ئەویش بەزەیی بە حاڵیاندا هاتەوە،

﴿٨٩﴾ وتی: ئایا ئەزانن کە چیتان کرد بە یوسف‌و براکەی کاتێك کە ئێوە نەزان بون؟

﴿٩٠﴾ گوتیان: ئایا تۆ یوسفی؟! وتی: بەڵێ من یوسفم‌و ئەویش براکەمە، بێگومان خوا منەتی نایەسەرمان کە خودا منی ڕزگار کردوەلەگەڵ ئەو سەختیەداو من ماوم‌و ئێستا پێغەمبەرم بێگومان هەر کەسێ خۆی بپارێزێ لە توڕەی‌و سزای خوداو خۆی ڕاگرێت لەکاتی تەنگ‌و چەڵەمەداو نا سوپاسی خوا نەکات ئەوە چاکەکارەو بێگومان خوا پاداشتی چاکەکاران زایە ناکات، جا کاتێ ئەمەیان لە یوسف بیست،

﴿٩١﴾ وتیان: بەخوا خوا تۆی ڕێزدارو پایەبەرزکرد بەسەر ئێمەداو بێگومان کە ئێمە تاوانبارین. ئینجا ڕووی تێکردن‌و دڵی دانەوە،

﴿٩٢﴾ وتی: لەمڕۆبەدواوە هیچ سەر کۆنەیەك ناکرێن‌و باسی پێشویش ناکەین، خوالێتان خۆش ببێت، وەهەر ئەوە لەهەمو بەرەحمەکان بەسۆزو بەرەحم ترە، ئابەو شێوە جوانەو بەو دوعا بەنرخە بێنیهایەت دڵی براکانی خۆشکرد، ئینجا شتێکی تری زۆر گرنگی لەگەڵدا کردن‌و موعجیزەیەکی پێغەمبەرایەتی خۆی پێشاندان‌و وتی:

﴿٩٣﴾ بڕۆن‌و ئەم کراسەی من ببەن‌و بیدەن بەسەر دەم‌و چاوی باوکم دا چاوی چاك ئەبێتەوەو هەمو خاو خێزانتان بهێنن بۆلام‌و کەستان بەجێ نەمێنێ.

﴿٩٤﴾ جا لە کاتێکدا قافڵەکە دەرچوون لە شاری میسر کە نزیکەی هەژدە فەرسەخ بەینیان بو بۆنی یوسف گەیشتە یەعقوب بۆیە باوکیان وتی: من بۆنی یوسفم بۆدێت ئەگەر نەڵێن ئەو شێت‌و خەرافاوە،

﴿٩٥﴾ جا ئەوانەی لەلای یعقوب بون لەو کاتەدا وتیان: بەخوا بێگومان تۆ لەسەر هەڵە کۆنەکەی خۆتی‌و هەر خۆشەویستی یوسفت لەسەردا ماوە. چونکە ئەوان لایان وابو کە یوسف مردوە، جا ئەوان بەخێرا لە میسرەوە مژدەدەرێکیان پێش قافڵەکە نارد بۆ لای باوکیان.

﴿٩٦﴾ جا کاتێك کە موژدەدەر هات ئەڵێن: ئەو برایەی بو کە کاتی خۆی کوراسە خوێناویەکەی یوسفی بۆ باوکی هێنا بو تا بەمە ئەو تاوانەی پێشوی بشواتەوە، ئەوسا کراسەکەی دا بەسەر چاوی باوکیاو کتوپڕ چاوی ساغ بویەوە، جا یەعقوب عليه السلام وتی: یوسفت بەجێ هێشت لەسەر چ ئاینێك بو؟ وتی: لەسەر ئاینی ئیسلام وتی: ئێستا نیعمەتی خودا بەتەواوی ڕژا بەسەرماندا، ئەی من

ئەم وت: بە ئێوە کە من شتانێك ئەزانم لەلایەن خواوە کە ئێوە نایزانن،

(٩٧) جا ئەوانیش پەشیمانی خۆیان لە ئیشە خراپەکەی خۆیان دەربڕیو وتیان: ئەی باوکی خۆشەویستمان بێگومان لە پاش ئەوەی کە داوای لێخۆشبونت لێ دەکەین تۆیش داوای لێخۆشبونمان بۆ بکە لە خودا بەڵکو لێمان خۆشببێ بێگومان کەئێمە گوناهبارو تاونبارین.

(٩٨) جا یەعقوب روی تێکردنو وتی: لەمەولا من داوای لێ خۆشبونتان بۆ دەکەم لەلای پەروەردگارم، واتە لەکاتی دوعا قبوڵ بوون دا داواتان بۆ دەکەم. ئەڵێن مەبەستی کاتی سەحر بووە کەمێ پێش نوێژی بەیانی کە ئەو کاتە یەکێکە لەو کاتانەی کەدوعای تێدا قبوڵ ئەبێ بێگومان کەخوا خوایەکی لێ خۆش بوەو بەسۆزە بۆ بەندەکانی. ئینجا یەعقوبو ئەو کەسانەی کە پەیوەندی بەوەبو لەسەر قسەی یوسفو ئاشکرابونی ئەو ڕۆڵە خۆشەویستەی بنەو بارگەیان پێچایەوەو بەرەو میسر کەوتنە ڕێو گەیشتنە شارو بەرەو کۆشکی یوسف رۆیشتن.

(٩٩) جا کاتێ کە بەباوكو دایکی چونە لای یوسف لەدەروازەی شاردا پێشوازییەکی شایانی لێکردنو وتی: بچنە میسرەوە ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بێ بەشێوەیەکی ئەمنو ئاسایش دەژین. ئینجا کاتێ کەگەیشتنە کۆشکەکەو چونە ژورەوە ،

(١٠٠) دایكو باوکی خۆی بردە سەر کورسی پاشایی خۆیو دایناو ئەوانیش هەمویان سەری رێزو گەورەییان بۆ نەوی کرد جا لەو کاتەدا یوسف روی لەباوکی کردو وتی: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەمە مانای خەوەکەم بو کەکاتی خۆی دیبوم کە خۆرو مانگو یانزە ئەستێرە سوجدەیان بۆ بردم کە پەروەردگارم ئەو خەوەی کرد بەخەوێکی حەقو راستو بێگومان خوا چاکەی لەگەڵما کرد کاتێ کەمنی لە زیندان دەر هێنا مەبەستی بیرەکەشە بەڵام ناوی نەبرد لەبەر دڵی براکانی وەئێوەی هێنا بۆلاەو بون بەشاری پاش ئەوەی کە لادێی بوون لەدوای ئەوەی کە شەیتان ئەو ناکۆکیەی خستبوە نێوان منو براکانم بێگومان پەروەردگارم وردبینە بۆ هەمو شتێك کە ئارەزۆی لێ بێو هەرکاتێ ئارەزۆی شتێك بکات هۆکانی بۆ ئامادە دەکات بێگومان کەئەو زانەرە بە هەمو ئیشەکانو ئیشەکانیشی لەسەر بناغەی داناییەو هیچ ئیشێکی بێ سود نیە، ئینجا ئەم دوعایە دەکاتو ئەڵێت:

فَلَمَّآ أَن جَآءَ ٱلۡبَشِيرُ أَلۡقَىٰهُ عَلَىٰ وَجۡهِهِۦ فَٱرۡتَدَّ بَصِيرٗاۖ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكُمۡ إِنِّيٓ أَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُواْ يَٰٓأَبَانَا ٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَآ إِنَّا كُنَّا خَٰطِـِٔينَ ﴿٩٧﴾ قَالَ سَوۡفَ أَسۡتَغۡفِرُ لَكُمۡ رَبِّيٓۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٩٨﴾ فَلَمَّا دَخَلُواْ عَلَىٰ يُوسُفَ ءَاوَىٰٓ إِلَيۡهِ أَبَوَيۡهِ وَقَالَ ٱدۡخُلُواْ مِصۡرَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ ﴿٩٩﴾ وَرَفَعَ أَبَوَيۡهِ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ وَخَرُّواْ لَهُۥ سُجَّدٗاۖ وَقَالَ يَٰٓأَبَتِ هَٰذَا تَأۡوِيلُ رُءۡيَٰيَ مِن قَبۡلُ قَدۡ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّٗاۖ وَقَدۡ أَحۡسَنَ بِيٓ إِذۡ أَخۡرَجَنِي مِنَ ٱلسِّجۡنِ وَجَآءَ بِكُم مِّنَ ٱلۡبَدۡوِ مِنۢ بَعۡدِ أَن نَّزَغَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بَيۡنِي وَبَيۡنَ إِخۡوَتِيٓۚ إِنَّ رَبِّي لَطِيفٞ لِّمَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٠٠﴾ ۞ رَبِّ قَدۡ ءَاتَيۡتَنِي مِنَ ٱلۡمُلۡكِ وَعَلَّمۡتَنِي مِن تَأۡوِيلِ ٱلۡأَحَادِيثِۚ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَنتَ وَلِيِّۦ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ تَوَفَّنِي مُسۡلِمٗا وَأَلۡحِقۡنِي بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠١﴾ ذَٰلِكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهِ إِلَيۡكَۖ وَمَا كُنتَ لَدَيۡهِمۡ إِذۡ أَجۡمَعُوٓاْ أَمۡرَهُمۡ وَهُمۡ يَمۡكُرُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَآ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ وَلَوۡ حَرَصۡتَ بِمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾

(١٠١) ئەی پەروەدگارم بێگومان کەتۆ پاشایەتیو مالیکیەتی میسرت بەمن بەخشیو منت فێر کرد لە چۆنیەتی خەو پەرژێنەکان ئەی دروستکەری ئاسمانانو زەوی تۆ دۆستو سەرپەرستو یارمەتی دەری منی لە دنیاو لە پاشەرۆژدا کاتی هاتنی مەرگم بمرێنە بە موسڵمانیو بمگەیەنە بە پیاو چاکان کە مەبەستی ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقوبە. بەم شێوەیە داستانی یوسف ﵇ کۆتایی پێ هاتو خوای زاناو دانا ئەفەرموێ:

(١٠٢) ئەوە بەشێکە لە هەواڵە نهێنیەکان کە ئێمە بە تۆمان گەیاندو تۆ ئەی محمد لای ئەوان نەبویت کاتێك کە ئەوان یەك قسە بون لە سەر ئەوپیلانو فێڵەیان بە یوسفو بە باوکیان، واتە: تۆ لەو بارەوە هیچت نە دەزانی.

(١٠٣) زۆربەی خەڵك باوەڕ ناهێنن ئەگەر چی تۆ زۆر سوربی لەسەر باوەڕهێنانیان. ئەڵێن خەڵکی مەکە پێشەکی بە پێغەمبەریان وتبو ئەگەر تۆ باسی یوسفمان بۆ بکەیت باوەڕ ئەهێنین بەڵام کاتێ خوای گەورەو دانا ئەم سورتەی ناردە لای پێغەمبەرﷺوبەو شێوە درێژە باسی بەسەر هاتی یوسفی کرد ئەوان باوەڕیان نەهێنا، بۆیە خوا ئەم ئایەتەی نارد کە دڵنەوایی پێغەمبەرمانی پێکرد کە نارەحەت نەبێ لەوەی کە ئەوان باوەڕناهێننو فەرموی:

وَمَا تَسۡـَٔلُهُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٤﴾ وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ﴿١٠٥﴾ وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ ﴿١٠٦﴾ أَفَأَمِنُوٓاْ أَن تَأۡتِيَهُمۡ غَٰشِيَةٞ مِّنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ أَوۡ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿١٠٧﴾ قُلۡ هَٰذِهِۦ سَبِيلِيٓ أَدۡعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۚ عَلَىٰ بَصِيرَةٍ أَنَا۠ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِيۖ وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسۡتَيۡـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ قَدۡ كُذِبُواْ جَآءَهُمۡ نَصۡرُنَا فَنُجِّيَ مَن نَّشَآءُۖ وَلَا يُرَدُّ بَأۡسُنَا عَنِ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدۡ كَانَ فِي قَصَصِهِمۡ عِبۡرَةٞ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِۗ مَا كَانَ حَدِيثٗا يُفۡتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصۡدِيقَ ٱلَّذِي بَيۡنَ يَدَيۡهِ وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿١١١﴾

﴿١٠٤﴾ ئەی محمد تۆ لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە بەوان سودی خۆتت نەویستووەو داوای پاداشتیان لێ ناکەیتو ئەم پەیامە بێجگە لە ئامۆژگاری بۆ هەموو عالەم شتێکی تر نیە. ئینجا خوای زانا زیاتر دڵی پێغەمبەرمان ﷺ ئەداتەوە ئەفەرموێ:

﴿١٠٥﴾ خۆ ئەوان گەلێك بەڵگەی ئاشکراو ڕون لەسەر دەسەڵاتو هێزی خوا لە ئاسمانانو زەویدا دەبینن‌و لەکاتی هاتوچۆو کارواندا دەدەن بەلایاندا کەچی ئەوان پشتی تێ دەکەن‌و سودی لێ وەرناگرن.

﴿١٠٦﴾ئەوسا زۆربەیان باوەڕ ناهێنن بە ﷲ بەڕێكو پێکی بەڵکو هەمیشە لەگەڵ بونی باوەڕ بە ﷲ دا ئەوان هاوەڵ دانەرن بۆیو کەسانی تر دەپەرستن، واتە مەرج نیە هەرکەسێ باوەڕی هەبێ بەخوا موسڵمان بێ بەڵکو زۆربەی باوەڕداران بە خودا موشریکن - خوا پەنامان بدات - خوێنەر ئێرە جێگای وردبونەوەیە چاك وردبەرەوە. ئینجا دەفەرموێ:

﴿١٠٧﴾ ئایا ئەوان ئەمینن‌و ناترسن لەوەی کە سزایەکی گشتیان لەلایەن خواوە بۆبێت یان کتوپڕ کاتی لە ناوچونیان بێت لە کاتێکا کە خۆیان هەستی هیچ شتێك نەکەن؟ واتە: سەرگەرمبون بەدنیاو نەترسان لە سزای خواو پشتگوێخستنی پاشە ڕۆژ، ناڕەواترین بۆچون‌وخراپترین ئیش‌و کاری مرۆڤە، پێویستە هەرچی زووتر بگەڕێنەوەو واز لەو ئیش‌و کارو بۆ چونە هەڵانە بهێنن‌و ئەو ڕێبازە ڕاستو دروستە بگرن کە ﷲ بۆی ناردون‌و ئەفەرموێ:

﴿١٠٨﴾ ئەی محمد ﷺبڵێ: ئائەمە ڕێگاو ڕێبازی منەو لەلایەن پەروەدگارەوە بۆم هاتووەو مایەی خۆشبەختی هەر کەسێکە کە بیکات بە بەرنامەی ژیانی خۆی لەبەر ئەوە من هەمیشە خەڵکی بانگ دەکەم بۆ لای ﷲ ، من‌و پەیڕەوانم بەرچاوڕونین‌و ئەزانم چی دەکەم‌و چی ئەڵێم‌و سەرئەنجامی پەیڕەوان‌و دژانم چی ئەبێ‌و ﷲ لە هەموو عەیب‌و عارو کەم‌و کوڕییەك دورەو من لە ریزی موشریکاندا نیم بەڵکو یەك خودا دەناسم کەتەنهایەو هاوەڵ‌و شەریکی نییەو ژیان‌و مردنم هەر بۆ ئەوەو بەندەی راستەقینەی ئەوم. ئینجا خوای زاناو دانا دەمکوتی ئەو کەسانە دەکات کە ئەیان وت: ئەگەر خوا پێغەمبەری بۆ ئێمە ڕەوانە بکردایە فریشتەی دەنارد نەك بەشەرێکی هەتیووکەم دەستیی وەك تۆو دەفەرموێ:

﴿١٠٩﴾بێگومان هیچ پێغەمبەرێکمان ڕەوانە نەکردوە لە پێش تۆدا مەگەر لە پیاوان بوبێ کە وەحیمان کردبێتە لایان‌و لە خەڵکی شارەکان بووبن‌و خەڵکی باوكو باپیرانی ناسیوون‌و هیچ پەیوەندییەکیان نەبوە بە فریشتەوە ئایا ئەوان ناگەڕێن بەسەر زەویدا، ئەوسا تەماشا بکەن‌و بزانن ئایا عاقیبەتی ئەو کەسانەی لە پێش ئەواندا بوون چی بو و چییان بەسەردا هاتوە تا بەڵکو پەندو ئامۆژگاریان لێ وەربگرن‌و چی تر بە دوای کلاوی بابردودا نەڕۆن؟ وە بۆ چاکانیش خوا ئەفەرموێ: بێگومان خانوو ماڵی ڕۆژی دوای کە قیامەتە هەرئەوە باشە بۆ ئەو کەسانەی کەلە خوا بترسن ئایا عەقڵتان نیەو ورد نابنەوە؟ واتە: شێت مەبن‌و ژیرانە بیر بکەنەوە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە پێغەمبەران هەموویان پیاو بوون‌و لە ژنان پێغەمبەر نەهاتوە.

جا ئەو پێغەمبەرانەو پەیڕەوانیان چونکە دنیا بۆ تاقیکرنەوەیە گرفتاری تەنگوچەڵەمەی زۆربوون بەشێوەیەك،

﴿١١٠﴾ تەنانەت پێغەمبەرەکان نائومێد بوون لە باوەڕ هێنانی گەلەکەیان‌و ئەو گەلانەش لە دوا کەوتنی سزای خوداو ماوەدانیان بۆ ژیان وایان گومان دەکرد کە پێغەمبەرەکانیان درۆیان لەگەڵدا کردوون لەبەرئەوە هیچ گوێیان بە خوداو پێغەمبەرەکانیانان

نەدەداو سەرگەرمی تاوان بون ئا لەو کاتەدا یارمەتی ئێمە بۆ پێغەمبەران‌و پەیڕەوانیان هاتوە ئەوسا ئەو کەسەی کە ئارەزۆمان لێبێت رزگاری دەکەین‌و بەر پەرج وریگریکیش نیە بۆلادانی سزای ئێمە لەتاوانباران، واتە، هەرکاتێ کە بمانەوێ تاوانباران سزا دەدەین ئینجا با دلنیابن کەلەدەست تۆڵەی ئێمە دەرناچن"مۆلەت دەدەین بەلام پشتگوێ ناخەین" هەرکەس چی کێلا دروێنەی دەکات.

(١١١) بێگومان لە باسکردنی داستانی ئەم پێغەمبەرو کەلەپیاوانەدا ئامۆژگاریەکی زۆر گرنگ هەیە بۆ ئەوکەسانەی کە خاوەنی عەقلن، واتە بێ عەقلەکان هیچ سودێکی لێ وەرناگرن، ئەوەتا لە رۆژی قیامەتیشدا دان ئەنێن بە بێ عەقلی خۆیاندا، ئینجا خوا لە وەسفی ئەم قورئانەدا ئەفەرموێ: ئەم قورئانە قسەیەکی دروستکراو نیە بەلکو وەلامێکی راست‌و دروستی ئەو رێبازەی پێش خۆیەتی کە هەوالی هاتنی ئەم پەڕاوەیان لە کاتی خۆیدا بەگەلانی خۆیان راگەیاندبو هەروەها رۆشنکەرەوەو درێژەدانە بەهەرشتێك کەوا پێویست بێت بۆ ئەم گەلەی ئەمرۆ لە حەرام‌و حەلال‌و بەرنامەو یاسای ژیانی ئەم گەلەیە تاهاتنی قیامەت‌و هیچ کەم‌و کوڕییەکی تێدا نیە لەبەر ئەوە نابێ پەیڕەوی بکرێت لە هیچ یاساو بەرنامەیەکی تر جگە لەم قورئانەکە هادی‌و رێ پیشاندەرەو رەحمەت‌و سۆزی خودایە بۆ ئەو گەلەی کە باوەڕی پێ دەهێنێ.

بەلێ هەرچەند یوسف لە سەردەمی خۆیدا بوختانی بۆ کراولەپاشدا پاکی لەمانگی چواردە رۆشنتر بویەوە بەلام لەم سەردەمەی ئێمەدا دیسان کەسانێك بەناوی رۆشنبیری‌و واقیع ناسییەوە بوختانی لەوە گەورەتر دەدەنە لای ئەو پێغەمبەرە بەرێزەو بەکارمەندو فەرمانبەرداری پاشایەکی موشریك‌و هابەشی کردن لە رژێمێکی کوفردا دای دەنێن، ئەمانە بەهەمو تواناتیانەوە هەول دەدەن‌و کێبەرکێ دەکەن بۆ مەبەستێکی خزبی‌و دنیایی خۆیان بە شوێنانێك بگەن کە ئەرکی سەرەکیان دانانی یاساو شەریعەتە بۆ مرۆڤ لەحالێکدا تەنها ئەوزاتەی کە دورستکەرە هەر ئەو بۆی هەیە کەبریار دەرکات‌ویاسا بۆ مرۆڤ دانێت﴿ أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُۗ / ئاگاداربن هەرخۆیەتی دروستکەروهەرخۆیشێتی بڕیاردەر ﴾ الأعراف: ٥٤

جا هەر یاسایەکیش جگە لە یاسای ٱللَّهُ کوفرو جەهالەت‌و نەفامیە بەلام ئەمانە هەرجار بەلگەیەك دەتاشن بۆ ئەوەی بیسەلمێنن کە ئیشەکەیان رەوایەو شەرعیە جارێك دەلێن: ئەوتە ئیسلام فەرمان بە "شورا" دەکات، وە ئەمەش واتە دیموکراتیەت لەحالێکدا کە دیموکراتیەت دینێکە کە مرۆڤ دەکات بەخواو مافی دانانی یاساو تەشریع بەو دەدات؟ جارێکی تر دەلێن: ئەوەی کە ئێمە دەیکەن لە سوێند خواردن لە سەرخۆ بەستنەوە بەو یاساو دەستورە دەستکردەی مرۆڤو هەروەها بەربەرەکانی لە سەرگەیشتن بەو کۆڕانەی کە ئەرکی سەرەکی دانانی یاسایە بۆمرۆڤ هەر ئەو رەفتارو هەلوێستەی یوسف پێغەمبەرە.

ئێمەش دەلێن: {سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ} بەراستی ئەمە چۆن بڕیارێکە کە هەلبژاردنی ئەرکی سەرپەرشتی کردنی خەزێنەکانی ولات‌و خستنە ژێردەسەلاتی پیاوێکی دەست پاك‌و لێزان ﴿ حَفِيظٌ عَلِيمٞ ﴾ لەپاش داواکاری سەرۆکی ولات وەك کێبەرکێ کردنە بۆهاوبەشی کردن لە ناو کۆڕێك کە ئەرکی سەرەکی دانانی یاساو حەلال‌و حەرام کردنە بۆ مرۆڤ؟! یان چۆن دەکرێت پیاوێك کە لە لایەن دەسەلات‌و مەلیکەوە هەمو جۆرە ئازادیەکی بۆ رەخسا بێت‌و پێی بوترێت: ﴿ إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ (٥٤) ﴾

وە پەروەردگاریش لە وەسفی ئەو دەسەلات‌و تەمکینەدا بفەرموێت: ﴿ وَكَذَٰلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَتَبَوَّأُ مِنۡهَا حَيۡثُ يَشَآءُۚ ﴾

وەك ئەو کەسە وایە کە پێش هەمو شت دەبێت سوێند بخوات کە لەو یاساو دەستورەی کە دەستکردی مرۆڤە دەرنەچێت‌و بڕیارێکیش نەدات کە دژ بەو یاسابێت؟!

بەراستی وێنەی ئەم دوانەوەك ئەو وێنەیە کە ٱللَّهُ دەفەرموێ: ﴿ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدٗا مَّمۡلُوكٗا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرّٗا وَجَهۡرًاۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَ / النحل: ٧٥ / واتە خوا وێنەیەك باس دەکات بەم چەشنە کە مرۆڤێك مولکی کابرایەك بێ‌و توانای هیچ

شتێكی نەبێت كە بیكات نە بۆ خۆیو نە بۆ خەڵك ئا ئەمە لەگەڵ كەسێكدا كە ئێمە رزقیكی چاكمان پێ دابێتو ئەویش بە كەیفی خۆی بە پەنامەكیو بە ئاشكرا بی بەخشێت ئایا ئەم دووانە وەك یەكن؟ ﴿

وە هەروەها دەبینین یوسفی پێغەمبەر كاتێك كە دووكەس لە هاوبەندەكانی دێنەلای بۆ ئەوەی خەونەكانیان بۆ تەعبیر بكاتەوە لەو مەجالە كەڵك وەردەگرێتو بانگیان دەكات بۆ یەكخواناسیو تەوحیدو پێیان دەڵێت: (ئەی دوو هاوڕێكانی بەندیخانەم ئایا خودایانی جیا لەیەك چاكن یان یەك خودای بە توانا؟ ئەوانەی كە ئێوە دەیانپەرستن بێجگە لە چەند ناوێك كە خۆتانو باو باپیرانتان بۆتان داناون شتێكی ترنین كە ﷲ یش هیچ بەڵگەیەكی لەسەر پەرستنی ئەوانە نەناردوە، فەرمانوبڕیاردان تەنها بۆ ﷲ یە، دەستوری داوە كە نابێت كەس ببەرستن بێجگە لەو ئائەوەیە ئاینێكی راستو بەنرخ بەڵام زۆربەی خەڵك ئەم حەقیقەتە نازانن}

جا ﴿فَلَمَّا كَلَّمَهُۥ﴾ لەو كاتەی كە ئازاد كراوەو رێزی لێگراوەو روبەروی پاشاو عەزیزی میسر بوەتەوەو قسەی لەگەڵدا دەكات دەبێت ئەو پێغەمبەرە باسی چی كرد بێت لەگەڵ پاشای میسردا؟ ئایا باس لەو بوختانەی دەكات كە بۆیان هەڵبەست لەحاڵێكدا پێشتر هەموشت لەوبارەوە ئاشكرا بویەوەو یوسف لە بەندیخانە نەهات دەرەوە تاكو راستیو حەقیقەت بۆ هەموان دەركەوت؟ یان ئایا باس لەگرفتەكانی ئابوریو بوجەی حیزبەكەی دەكات؟! یان ئەوەی كە هەرچۆن كاتێك كە بێ دەسەڵاتو دیلبو بانگەوازی بۆ یەكخواناسیو حاكمیەتی (ﷲ)ی دەكرد ئیستادەگونجێت وازی لەو هێنا بێتو ئەركی پێغەمبەرایەتی خۆی پشتگوێ خستبێت؟! یان ئایا دەگونجێت پاشایەكی كافرو ملهوڕ بە پێغەمبەرێك كە دژ بە كوفرو خراپەی ئەو بێت بڵێ: ﴿إِنَّكَ ٱلۡيَوۡمَ لَدَيۡنَا مَكِينٌ أَمِينٞ ٥٤﴾ وە ئەو ئەركەی كە خۆی هەڵی بژێرێت پێی بداتو سەرپشكیشی بكات لە هەر شتێك كە دەیەوێت ئەنجامی بداتو تەعبیری خەونەكەیو ئەو گرفتو بەسەرهاتانەی كە لە ماوەی چواردە ساڵدا بەسەر حكومەتەكەی تێت بەراستی بزانیت بەڵام باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی ئەونەبێت؟!

"**الط ي**" وە هەروەها "**البغوي**" لە مجاهیدەوە دەگێڕێنەوە كە: (**أسلَمَ المَلِكُ الذي كانَ مَعَهُ يُوسُف**) وە "**الفرط** "ش دەڵێت: (**ولَمّا فوض المَلِكُ أمرَ مِصرَ إ يُوسُفَ تَلطفَ بِالناس، وَجَعَلَ يَدعُوهُم إ الإسلامِ حَتى آمنوا بِهِ، وَأقامَ فيهمُ العَدلَ، فأحبه الرجالُ والنّساءُ** / واتە كاتێك كە پاشای میسر كاروباری میسری خستە ئەستۆی یوسف، یوسفیش لەگەڵ خەڵك دا بە میهرەبانی وبە چاكە هەڵسوكەوتی دەكردو بانگەوازی دەكردن بۆ ئیسلام تا باوەڕیان پێ هێنا، وە بە داد پەروەری هەڵسوكەوتی دەكرد بۆیە پیاو ژن خۆشیان دەویست)

جا ئەگەر وابێت قیاسەكەیان هەر لە بناغەدا روخاوە.

لەلایەكی دیكە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێت: {**لَيأتِيَن عَلَيكُم أمَرَاءُ يُقَرِّبُونَ شِرارَ الناسِ وَيُؤَخِرُونَ الصلاةَ عَن مَوَاقِيتهَا فَمَن أدرَكَ ذَلِكَ مِنكُم فَلا يَكُونَن عَرِيفاً وَلا شُرطِياً وَلا جَابِياً وَلا خَازِناً**/صحيح ابن حبان، صحه الالبا / سەركردەیانێك دێن بەسەرتان كە خەڵكی خراپ لە خۆ نزیك دەكەنەوەو نوێژەكانیان لە كاتی خۆیان دا دوادەخن جا هەركەستان گەیشت بەو سەردەمە با نە ببێ بە نوێنەرو نە بە پۆلیسو نە بە كۆكەرەوەی ئابونەو نە بە خەزێنەداری }

تاوانی ئەم دەسەڵاتداراو ئەمیرانە تەنها ئەوەیە كە پیاوە خراپەكان لە خۆیان نزیك دەكەنەوەو كاروباری حكومەت بەوان دەسپێرنو نوێژەكانیان لەكاتی خۆیدا دوا دەخەن جا هەرچەند ئەوانە كافر نیین بەڵام پێغەمبەرمانﷺ قەدەغەی كردوە كە باوەڕدار لەو دەسەڵاتە دا بەرپرسییەك وەرگرێت كە ببێت بە هۆی یارمەتی دەری ئەو دەسەڵاتە.

جا با ئەوانەی كە ئەو ئیشە كوفرەی خۆیان دەدنە لای یوسفی پێغەمبەرەوە لە ﷲ بترسنو شەرم بكەن كە ئاوا بوختانێك بدەنە لای ئەو پێغەمبەرەو تەوبە بكەنو لەو تاوانەو بگەڕێنەوە. خودایە لە ریزی هەڵگرانی راستەقینەی ئەم پەیامە بەنرخو بەرێزەی خۆتدا حیسابمان بكەیتو كردارە چاكەكانمان لێوەرگریتو بەزەییت بێتەوە بە حاڵمانداو چاوپۆشی لە خراپەكانمان بكەیت، ئامین یارب العالمین.

١٣ سورەتی رەعد ٤٣

سورەتی رەعد كە سورەتی سیانزەهەمی قورئانە، چل‌وسێ ئایەتە سورەتێكی مەكیە لەسەر قسەی حەسەن وعیكرەمەو عەتاو جابیر، وە مەدینەنییە لەسەر قسەی موقاتل، بەڵام شێوازی سورەتەكە بەگشتی لە سورەتە مەكییەكان دەچێت.

وشەی ﴿ ٱلرَّعۡدُ ﴿١٣﴾ ﴾ لەم سورەتەو وشەی ﴿ وَرَعۡدٌ ﴿١٩﴾ ﴾ لە سورەتی بەقەرەدا هاتوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف،لام،میم،را. ئەوەی كە ئەی خوێنینەوە بۆ تۆ چەند نیشانەیەكن لەو قورئانەی كە ناردومانە بۆت، وە ئەوەی كە رەوانە كراوە بۆت ئەی محمد ﷺ لەلایەن پەروەردگارتەوەیەو راستەو دروستەو هیچ گومانت تێیدا نەبێت بەڵام زۆربەی خەڵك باوەڕناهێنن. ئینجا خوای زاناو دانا هەندێ لەنیشانەكانی دەسڵات وهێزی خۆی باس ئەكات بۆئەوەی مرۆڤ بیریان لێ بكاتەوەو سودیان لێ وەرگرێ‌و ئەفەرموێ:

(٢) ﷲ ئەو زاتەیە كە ئاسمانی بەرزكردوەتەوە بێ كۆڵەكەیەك كە ئێوە ببینن، جا یان هەر كۆڵەكەی نیە یان هەیەتی‌و ئەوحەجمە گەورەو گرانەی هەڵگرتوە بەڵام چاوی ئێمە نایبینێت یەك لەیەك گرنگترە لەپاشان خوا قەراری گرت لەسەر عەرش بەو قەرارگرتنەی كە هەرخۆی دەزانێت چۆنەو رۆژو مانگی گەردنكەچ‌و رام كردوە بۆ خزمەتی مرۆڤ كە هەمویان دێن‌و دەڕۆن بۆخاتری كاتێكی دیاری كراو كە بەو هاتو چۆیانە تەمەنی دنیا دوا ئەهێنن‌و جیهانێكی زۆر گەورەو فراوانتر دێتەكایەوەو مرۆڤ لەو جیهانەدا بەرهەمی ئیشەكانی خۆی وەرئەگرێت چاك بەچاك‌و خراپ بەخراپ، وە خوای داناو زانا هەمو كاروبارەكانی ئەم بونەوەرە بەرێك‌و پێكی ئەبات بەڕێوەو درێژەئەدات بەرونكردنەوەی نیشانەكانی تا بەڵكو ئێوە بەگەیشتن بەخوای خۆتان یەقین پەیدا بكەن‌و بزانن كە ئەو زاتەی ئەوهەمو شتە گرنگانەی لەنەبون دروستكردوە ئەتوانێت جارێكی تر مرۆڤ زیندو بكاتەوەو گێرەو كێشەی كردەوەكانی لەگەڵ دا بكات، ئینجا زیاتر درێژە بەباسكردنی نیشانەكانی ئەداو ئەفەرموێ:

(٣) جا ﷲ ئەو زاتەیە كە زەوی وەك سفرەیەك راخستوەو لەناویدا چیا گەلێكی بەهێزو گەورەو بتەوو چەندین جۆگاو روبارو دەریای داناوەكە لەم گردەخاكەدا سەرچاوەی ژیانن، وە بۆ لەزەتو خۆشی‌و كامەرانی مرۆڤ لەم زەوییەدا لە هەمو بەرو بومێك دوو جۆری داناوە كە هەمو شتێك نێرو مێی‌و چاك

١٣ سُورَةُ الرَّعۡدِ ٤٣

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِۗ وَٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ٱلۡحَقُّ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي رَفَعَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيۡرِ عَمَدٖ تَرَوۡنَهَاۖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ يُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لَعَلَّكُم بِلِقَآءِ رَبِّكُمۡ تُوقِنُونَ ﴿٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي مَدَّ ٱلۡأَرۡضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۡهَٰرٗاۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ يُغۡشِي ٱلَّيۡلَ ٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٣﴾ وَفِي ٱلۡأَرۡضِ قِطَعٞ مُّتَجَٰوِرَٰتٞ وَجَنَّٰتٞ مِّنۡ أَعۡنَٰبٖ وَزَرۡعٞ وَنَخِيلٞ صِنۡوَانٞ وَغَيۡرُ صِنۡوَانٖ يُسۡقَىٰ بِمَآءٖ وَٰحِدٖ وَنُفَضِّلُ بَعۡضَهَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فِي ٱلۡأُكُلِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٤﴾ ۞ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٥﴾

وخراپی هەیەو زۆریان بەشێوە لەیەك ئەچن بەڵام تام‌و چێژیان لەیەك جیایە وهەر لەوجوتانەیە شەوو رۆژ كە خوای زاناو دانا شەو بەرۆژو رۆژ بەشەو دائەپۆشێت‌و بەپەلە بەشوێن یەكدا دێن‌و بەگوێرەی پێویستی مرۆڤ كەم‌و زیادیان پێ ئەكات، ئایا بێجگە لە خوای زاناو دانا كەسێكی تر هەیەكەبتوانێ ئەم كارانە ئەنجام بدات؟ دەی ئەگەر ژیرانە بیربكەنەوە ئەزانن كەبەبێگومان ئالەو شتانەی كەباسكران چەندین بەڵگەی گرنگ هەیە بۆ ئەو گەلەی كە بیر بكاتەوە. دیسان ﷲ سرنجی مرۆڤ رائەكێشێ بۆ لای چەندین بەڵگەی گرنگی تر لەسەر زانایی‌و دانایی‌و دەسەڵاتی خۆی‌و ئەفەرموێ:

(٤) خۆ هەرلەناو ئەم زەوییەدا چەندین پارچە زەوی نزیك لەیەك‌و هاوسێی یەكن، وەچەندین باخچە لەترێ ودانەوێڵەی چێنراو ودرەختی خورما كەهەندێكیان لەسەر یەك ریشەزیاتر لە پەلێكی لێ پەیدا بوەو وهەندێكی تریان تەنها یەك پەلە ئەمانە هەمویان بەیەك ئاو ئاوئەدرێن‌و هاوسێی یەكن، ئەی كێ واجیای كردونەتەوە؟ بەڵێ لەیەك زەوی وبەیەك ئاو هەزارەها دانەوێڵەو میوەی جۆراوجۆر هەریەك بۆنی‌و هەریەك تامێكی تایبەتی خۆی هەیەو هەندێكی لەهەندێكی تریان بەنرخ ترو چاكترو بەتام ترمان كردوە لەخواردندا، دەی ئایا ئەمانە بێجگە لە ئێمە كەسێكی تر ئەتوانێت ئەو جۆراو جۆرو گۆڕانكارییە بكات؟ كەواتە ئەگەر بەچاكی ورد ببنەوە ئەزانن كە بەبێگومان ئالەمەدا

وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبۡلَ ٱلۡحَسَنَةِ وَقَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِمُ ٱلۡمَثُلَٰتُۗ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغۡفِرَةٖ لِّلنَّاسِ عَلَىٰ ظُلۡمِهِمۡۖ وَإِنَّ رَبَّكَ لَشَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَةٞ مِّن رَّبِّهِۦٓۗ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرٞۖ وَلِكُلِّ قَوۡمٍ هَادٍ ﴿٧﴾ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ﴿٨﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡكَبِيرُ ٱلۡمُتَعَالِ ﴿٩﴾ سَوَآءٞ مِّنكُم مَّنۡ أَسَرَّ ٱلۡقَوۡلَ وَمَن جَهَرَ بِهِۦ وَمَنۡ هُوَ مُسۡتَخۡفِۭ بِٱلَّيۡلِ وَسَارِبُۢ بِٱلنَّهَارِ ﴿١٠﴾ لَهُۥ مُعَقِّبَٰتٞ مِّنۢ بَيۡنِ يَدَيۡهِ وَمِنۡ خَلۡفِهِۦ يَحۡفَظُونَهُۥ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ وَإِذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ سُوٓءٗا فَلَا مَرَدَّ لَهُۥۚ وَمَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَالٍ ﴿١١﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنشِئُ ٱلسَّحَابَ ٱلثِّقَالَ ﴿١٢﴾ وَيُسَبِّحُ ٱلرَّعۡدُ بِحَمۡدِهِۦ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ مِنۡ خِيفَتِهِۦ وَيُرۡسِلُ ٱلصَّوَٰعِقَ فَيُصِيبُ بِهَا مَن يَشَآءُ وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ ﴿١٣﴾

چەندین بەڵگەی گرنگ هەیە بۆ ئەو گەلانەی کەوا ژیری بەکاربێنن.

ئینجا ﷲ دڵی پێغەمبەرمان ﷺ ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿٥﴾ ئەی محمد ﷺ ئەگەر تۆ پێت عەجایبە کەئەوان باوەڕبەم قورئانە ناکەن عەجایبتر لەوە ئەوەیە کەئەڵێن: ئایا ئێمە مردین‌و بوین بەگڵ وخاك تازە ئەکرێینەوە بە مرۆڤ ئیتر بیر ناکەنەوەو بزانن کە ئەو کەسەی کە ئەوانی لە سەرەتاوە دروستکردوە کە هیچ نەبون بۆ ناتوانێت لەو خاکە جارێکی تر دروستیان بکاتەوە وەکو خۆیان؟ ئینجا ئەفەرموێ: ئائەوانە کەسانێکن کەبێ باوەڕن بەخوای خۆیان، وەئەوانە لەرۆژی قیامەتدا ئەو زەنجیرەی کە دەستیانی پێ بەسراوەتەوە لەملیاندایەو بەرەو ئاگری جەهەنم بەڕێ ئەکرێن، وە ئەوانە رەفیقی دەستە ملی ئاگری جەهەنمن وئەوان بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە. ئینجا خوا زیاتر سەرزەنشتی بێ باوەڕان ئەکات‌و ئەفەرموێ:

﴿٦﴾ جا ئەوان بە پەلەن بۆ خراپە کردن‌و هاتنی سزای ﷲ پێش ئەوەی کە چاکە بکەن‌و بگەڕێنەوە بۆلای خواو بەدەست هێنانی بەهەشت بەڵێ زۆر جار بێ باوەڕانی کۆن‌و تازە چونکە باوەڕیان بەﷲ و بەهێزو دەسەڵاتی ئەو زاتە نیەو هەمیشە بەگاڵتەوە ئەڵین: ئەگەر راستە با سزای خوا بێت، ئەوە نەبێ کە ئەمانە ئەوندە بەغیرت بن‌و لەسزا نەترسن بەڵکو بێ باوەڕن‌و باوەڕیان نیە کە خودا ئەتوانێ شتی وایان بەسەردا بهێنێ لەحاڵێکدا پێش ئەوان وێنەی ئەوان زۆربوەو جۆرەها سزایان هاتوەتە سەرو شوێنەواری زۆریان لەبەرچاویانە، بەڵام بێگومان کەخوای تۆ زۆر لێخۆشبو داپۆشەری تاوانەکانی خەڵکە لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەوان ستەمکارن، بەڕاستی ئەمە گەورەترین دڵخۆشیکردنی مرۆڤە لەلایەن خوای خاوەن هێزو دەسەڵاتەوە لەگەڵ بونی ستەمیان هێشتا ئەفەرموێ: زۆر چاوپۆشیکارم لێیان، دەی ئیتر ئەوکەسانەی کە سوپاسی ئەو خوا بێ نیازو میهرەبانە نەکەن‌و هەر خەریکی تاوان بن بابزانن کە خوا بێ ئاگانیە لێیان، وە بێگومان کە خوای تۆ زۆر زۆر بەهێزە لەبارەیەی تۆڵەوەو سزاکانیشی زۆرتوندو سەختە. بەداخەوە بێ باوەڕان لەو هەمو میهرەبانی‌و ماوەدانەی خوا سود وەرناگرن.

﴿٧﴾ جا کافرەکان دەڵێن: دەی نیشانەیەك وەك نیشانەکانی پێغەمبەرانی پێشوو بهاتایە بۆ ئەو وەك عەسای موساو وشتری ساڵح ئیتر بیر لەوە ناکەنەوە کەئەم محمدە ﷺ یەك پیتی نەخوێندوە ئەی ئەم قورئانە راست ورەوانە چۆن ئەزانێ؟ ئینجا خوا ئەفەرموێ: بێگومان تۆ تەنها ترسێنەرێکی‌و گوێ بەقسەی ئەوان مەدەو بۆ هەمو گەلێکیش رێپشاندەربوەو تۆیش رێپیشاندەری ئەم گەلەی خۆتیت‌و بێجگەلەوە شتێکی ترت پێ نەسپێرراوە. خوا درێژە بە نیشانەکانی زانایی وتوانایی خۆی دەدات دەفەرموێ:

﴿٨﴾ خوا ئەو زاتەیە کە ئەزانێت هەموو مێ یەکان چی هەڵدەگرن‌و بەچی باردار ئەبن‌و چۆن دروست ئەبێت‌و ئەزانێت کە ئەو منداڵدانەی ئافرەت چەند لەو تۆیانە کەم ئەکاتەوەو لەناویان ئەبات‌و بەهۆی ئەو منداڵەوە خۆی یان منداڵەکەی یان هەردووکیان چەند زیاد دەکات، وە ئەو ئافرەتە بەخۆی نازانێ پاش ئەوەی کەیەك زەڕەیەو لەپشتی باوەکەوە ئەکەوێتە منداڵدانی دایکەوە بۆ ماوەی نۆ مانگ کێشەکەی ئەگاتە سێ کیلۆ کەمێ کەم تر یان کەمێ زیاتر بێ ئەوەی ئەو دایکە هەستی پێ بکات‌و بزانێ رۆژانە ئەومنداڵەومنداڵدانی چەندە گەورە دەبێت، بەراستی زانیاری هەمو شتێك لەلای ﷲ ئەندازەگیراوەو لەوئەندازەیەی کە خوا دیاری کردوە زیادو کەمی تێدا ناکرێت مەگەر ﷲ خۆی ئارەزۆی لێ بێت، جالەسەر ئەم بناغە نەگۆڕەیە کەموسڵمانی راستەقینە بەتەنگ‌و چەڵەمەکانی زەمانەو هەڕەشەو گوڕەشەی ستەمکاران دڵی نەترساوەو وازی لە بەندایەتی خودا نەهێناوەو حەوسەڵەو خۆگری تێشوی رێگای بووەو ئارام ئارام بەرەو رەزامەندی ﷲ هەنگاوی هەڵگرتوەو

دڵنیابوە کەهەمو شت لەلای خوای زاناو دانا کاتی تایبەتی خۆی هەیە.

(٩) جاخۆی سپاردوە بەو زاتەی کە زانەری هەمو پەنامەکیەکانو ئاشکراکانەو هەر خۆیەتی کەزۆر گەورەیەو هەمو گەورە کانی دنیا لەژێر دەستی ئەودان وبەرزو سەرکەوتوە بەسەر هەمو شتێکدا. بەراستی زانابییەکەی ئەوەندە زۆرە ئەفەرموێ:

(١٠) هەر کەس لەناو ئێوەدا بەنهێنی قسە بکات یان بەئاشکراو لەتاریکای شەودا خۆی بشارێتەوە یان بەئاشکرا لەرۆژدا بەرێگادا بڕوات زانینی ئەوەلەلای ﷲ یەکسانەو ئەبێ ئاگاداری خۆتان بن کە لەهیچ کاتێك دا روبەڕوی تاوان نەڕۆن چونکە ﷲ ئاگادارە لێتانو جێگایەك نیە کەئێوە خۆتانی لێ بشارنەوەو هەمیشەش دەیان فریشتەی چاودێریکەری هەیە لەسەر مرۆڤو ئەفەرموێ:

(١١) بۆ ئەوان هەمیشە چاودێری کەر هەیە کەلەبەرو پشتەوە ئەیان پارێزێت لە سەختیو تەنگو چەڵەمەو ئێشو ئازار تائەوکاتەی کەخوا مەیلی پاراستنیانی هەیەو هەر کاتێ ویستی توش ببن ئەوان بەفەرمانی ﷲ وازی لێ ئەهێنن. کەواتە مرۆڤی ژیرو زاناو بەبیر ئەو کەسەیە کە تەنها لەخوا بترسێتو باکی لە کەس نەبێت. ئەمەش بەو مانا نیە کە مرۆڤ هۆیەکان بەکار نەهێنێ بەڵکو پێویستە مرۆڤ هەر هۆیەك لە توانایدا هەیە بۆ پاراستنو شتی تریش بەکاری بێنێ وەکو لێرەدا ئەفەرموێ: بێگومان ﷲ بارودۆخی هیچ گەلێك ناگۆڕێ هەتا ئەو گەلە خۆیان هەوڵی گۆڕانی نەدەن واتە: ئەو گەلەی کە لەناو نازو نیعمەتدا بێ لێی تێك نادرێ هەتا خۆی نا سوپاسیو خراپە نەکات، وە لەبارودۆخی خراپیش دابێ دیسان خوا نایگۆڕێ هەتا خۆیان هەوڵی گۆڕاندنی نەدەن، جا هەر کاتێ مرۆڤ ژیری خۆی خستەکارەوە یان بێ عەقڵانە رەفتاری کرد خوا لەسەر دەستی ئەو چاکە یان خراپەیان بۆ ئەکات، واتە: گۆڕێنەری بنەڕەتی هەر خۆیەتی جا ئەگەر ﷲ ویستی گەلێك دوچاری سزا بکات هیچ بەرپەرچێکی نابێ وئەو سزایە دێتە سەریان، نەسەروەتو نەسامانو نەهێزو نەپاسەوان ناتوانێ هیچ کەسێك بپارێزێ لەوویستو ئارەزۆی خودای جیهانو نییە بۆ ئەوان بێجگە لە ﷲ هیچ دۆستو سەرپەرشتیکارێك تا بیان پارێزێ. ئینجا خوای زاناو بە دەسەڵات هەندێکی تر لە نیشانەکانی هێزو دەسەڵاتی خۆی باس ئەکاتو ئەفەرموێ:

(١٢) ﷲ ئەو زاتەیە کە ئەو بروسکە لە ئاسمانەوە پیشانی ئێوە دەدات هەم بۆ ترس هەم بۆ تەماع، ترستان هەبێ لەو بروسکەیە کە لە خۆتانو ماڵو منداڵتان بداتو بتان کوژێت، وە ئومێدیشتان هەبی کە بارانتان بۆ ببارێنێت وگیاو گوڵتان بۆ سەوز بکات و(ﷲ) ئەو هەرخۆیەتی کە ئەو هەورە گەورەیە دروست ئەکات کە ئەو هەمو بارانەی تێدایەو بەم لاولادا ئەیبات بێ ئەوەی یەك تکە لەو ئاوە بکەوێتە خوارەوە تا خوا ئارەزۆ نەکات.

(١٣) خۆ ئەو هەورە تەسبیحات دەکات لەگەڵ سوپاسی خوادا، جا یان هەروا بەڕاستی تەسبیحات وسوپاسی خوائەکات بەڵام ئێمە تێیناگەین یان دروستبونی ئەو هەورەو کۆکردنەوەی ئەو ئاوەزۆرەو نەڕژانی مەگەر بە شێوەیەکی رێك وپێك بەڵگەی بێ عەیبی خودایەو هەمو کەس ئەبێ سوپاسی بکات لەسەر ئەونیعمەتە گەورەیە کە ئاوەو مایەی ژیانەو فریشتەکانیش لەترسی ئەو زاتە تەسبیحاتی ﷲ دەکەن. ئینجا ئەو دەنگە دەنێرێتو ئەیدات لەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێ، وە ئەوانەی کە دەمەدەمە دەکەن لەبارەی (ﷲ)ـە لەحاڵێکدا کە ئەو زاتە زۆر بەهێزو بە توانایە لەبارەی ئاڵوگۆڕ کردنە کانەوەو هەر کاتێ چی ویست ئاوا دەبێ. ئەڵێن: هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بو کە پێغەمبەرمانﷺ پیاوێکی نارد بۆ لای یەکێك لە گەورە پیاوانی بت پەرستان کەبانگی بکات بۆ سەر ئاینی ئیسلام کەچی ئەو وتی : ئەو خوایی محمدە چییەو بۆم باس بکە ئایا لە زیوە یان لە ئاڵتون یان مزە؟ کابرا هاتەوە خزمەتی پێغەمبەرو وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئاوەهای وت فەرموی بگەڕێرەوە بانگی بکە _جارێك یان دووجار_ ئەم قسەیەی دووبارە کردەوە جاری سێهەم کە چۆوە بۆ لای دی هەورێك هاتو ترەقاندی بەسەریاو کوشتیو هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خواﷺ ئەم ئایەتە هاتبوە خوارەوە(ئەبو یەعلاو بەزار).

(١٤) تەنها بۆ خۆیەتی دەعوەتی راستەقینە کە بریتیە لە وشەو مانای (لااله الا الله) جا بێ باوەڕان بابزانن کە خواکانیان بێ کەڵکن ئەوانەی کە ئەوان بانگی دەکەنو دەیپەرستن بێجگە لە ﷲ هیچ وەڵامێکی ئەوان نادەنەوەو ناتوانن هیچ سودێکیان پێ بگەیەنن مەگەر وەکو ئەو کەسەی کە دەستی خۆی لەسەر لێواری بیر درێژ بکات بۆناو بیری ئاو تا ئاو بگەیەنێتە دەمی خۆی کە هەرگیز بەو شێوەیە نەدەمی بەو ئاوە دەگاتو نە ئاویش دێت بۆ ناو دەمی کە ئەمە وێنەیەکە بۆ ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی فەرمانی جگە لە ﷲ دەکەن، واتە ئەوانەی خودایان بەجێ هێشتوەو بەدوای شتانی تر کەوتون هەرگیز سودیان لێ وەرناگرنوکارو تەلاشیان بێهودەیە بۆیەﷲ دەفەرموێ: پەرستنی کافرانو هاوار کردنیان بۆ غەیری ﷲ هیچ نرخێکی نیە بێجگە لە قسەیەکی بێهودەو سەر لێ شێوانێکی زیاتر بەڵکو لەراستیدا بەم پەرستنەی ئەبێ بە دوژمنی هەمو دروستکراوەکانی ﷲ، چونکە هەمو دروستکراوەکانی ﷲ بێجگە لە بەشی زۆری مرۆڤو

لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿١٤﴾ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ۩ ﴿١٥﴾ قُلۡ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ قُلِ ٱللَّهُۚ قُلۡ أَفَٱتَّخَذۡتُم مِّن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ لَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ نَفۡعٗا وَلَا ضَرّٗاۚ قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ أَمۡ هَلۡ تَسۡتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُۗ أَمۡ جَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ خَلَقُواْ كَخَلۡقِهِۦ فَتَشَٰبَهَ ٱلۡخَلۡقُ عَلَيۡهِمۡۚ قُلِ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ﴿١٦﴾ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَسَالَتۡ أَوۡدِيَةُۢ بِقَدَرِهَا فَٱحۡتَمَلَ ٱلسَّيۡلُ زَبَدٗا رَّابِيٗاۖ وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيۡهِ فِي ٱلنَّارِ ٱبۡتِغَآءَ حِلۡيَةٍ أَوۡ مَتَٰعٖ زَبَدٞ مِّثۡلُهُۥۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡحَقَّ وَٱلۡبَٰطِلَۚ فَأَمَّا ٱلزَّبَدُ فَيَذۡهَبُ جُفَآءٗۖ وَأَمَّا مَا يَنفَعُ ٱلنَّاسَ فَيَمۡكُثُ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿١٧﴾ لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱلَّذِينَ لَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُۥ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡحِسَابِ وَمَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿١٨﴾

جنۆکە لەیاسای ﷲ دەرناچن‌و هەموویان گەردنکەچ‌و گوێ رایەڵی فەرمانی پەروەردگاریانن‌ودژی دوژمنانی (ﷲ)ـن وەکو لێرەدا ئەفەرموێ:

﴿١٥﴾ ئەوسا هەربۆ ﷲ گەردن کەچن ئەوانەی کە لە ئاسمانان‌و زەوی دان چ بەکەیفی خۆیان وەکو باوەڕداران یان بەناچاری وەکو کافران، تەنانەت کافرانیش لە زۆربەی هەڵس‌و کەوت‌و کاروباریاندا گەردنکەچ‌و رامن بۆ خودا، بۆنمونە، کابرای کافر ناتوانێت ئەگەر باڵای بەرز بێت خۆی نزم کاتەوە وخەوی بێت ناتوانێت نەخەوێت‌و برسی بو ناتوانێت برسی نەبێت وخودا هەر رەنگێکی پێدابێ ناتوانێ بیگۆڕێت‌و کاتی دروستبونی هەروەکو کاتی مردنی بەدەست خودایە، وە زۆربەی هەرەزۆری بارودۆخەکانی ژیانی‌و دەوروبەری رام‌و گەردنکەچی خودان، خۆ سێبەرەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا گەردنکەچ‌و رامی ئەو بەرنامەیەن کە خودا بۆی داناون بە بەیانیان‌و بە ئێواراندا کەسێبەری بەیانیان لەلایەکەوەیەو ئێوارانیش لەلایەکی ترەوەیەو کەم‌و زیاد دەبن بەهۆی ئەو روناکی رۆژەوە کە ﷲ لەناو ئەم بونەوەرەدا دایناوەو خولانەوەی رۆژی کردوە بەهۆی گۆڕانی کە گۆڕانی رۆژ گەورەترین بەڵگەی هێزو توانایی‌و زانایی‌و دانایی خودایە، هەروەها ﷲ درێژە بە دەرخستنی نیشانەکانی هێزو یەکتای خۆی ئەدات‌و ئەفەرموێ:

﴿١٦﴾ بڵێ: کێ پەروەردگاری ئاسمانان‌و زەویە؟ تۆ خۆت وەڵام بدەرەوە بڵێ تەنها(ﷲ)یە پەروەردگاری ئاسمانان وزەوییە،دەی پێیان بڵێ: ئایە ئێوە بێجگە لە خوا دۆستانێکی تر ئەکەن بەیاوەرو یارمەتی دەری خۆتان کە ئەوانە بۆ نەفسی خۆیشیان نەسودیان هەیەو نەزیان ئیتر ئێوە چاوەڕوانی چییان لێ دەکەن؟ ئینجا خوا نمونەی باوەڕدارو بێ باوەڕ بەم شێوەیە باس ئەکات‌و ئەفەرموێ: پێیان بڵێ ئەی محمدﷺ ئایا وەکو یەکە کوێرو چاو ساق، ئیماندارو کافر؟ یان ئایا رووناکی‌و تاریکی، باوەڕبون بە ئیسلام‌و بێدینی وەکو یەکن؟ ئاشکرایە وەڵامی نەخێرە، ئەم وشەی(ام)ـە بۆ گۆاستنەوەیە، واتە واز بهێنە لە قسەی پێشو. ئایا ئەوان هاوبەشانێکیان دا ناوە بۆ خوا کە خەڵکیان دروستکردوە هەروەکو چۆن خوا دروستی کردوە، جا لەبەر ئەوە لێیان گۆڕا بێت‌و نەزانن کامیان بپەرستن، واتە: بۆ ئەوەندە گێل‌و گەمژەن دروستکاری ئەم بونەوەرە گەورەو پڕسەیرو سەمەرەتان بەجێ هێشتوەو خەریکی پەرستنی بەندە بێ دەسەڵاتەکانی ئەون؟! دیسان ﷲ ئەفەرموێ: پێیان بڵێ ﷲ بەدیهێنەری هەمو شتێکەو هەر ئەوە تەنهایە لەزات‌و سیفات‌و کرداریداو خاوەن دەسەڵاتە. جارێکی تر ﷲ دوو نمونە لەسەر حەق‌و ناحەق باس ئەکات‌و ئەفەرموێ:

﴿١٧﴾ خوا لە ئاسمانەوە بارانی ناردوەتە سەر زەوی‌و هەمو شیوو دۆڵەکان هەریەك بە ئەندازەی خۆی لافاوی پێداهات، جا ئەو لافاوانەش کەفێکی زۆرو بەرچاویان هەڵگرتوەو، واتە: خوا بەرنامەی خۆی رەوانە کردوەو هەر دڵێك بە ئەندازەی خۆی خواناسی‌و زانستی وەرگرتوە لەو بەرنامانەی خواش کە هاتوە یەکێکیان کەبۆئەم گەلەیە قورئانە کە پڕوپاگەندەی خراپ چواردەوری داوەو داپیۆشیوە، ئەمە وێنەی یەکەم بوو جا بۆ وێنەی دووهەم ئەفەرموێت: وە هەندێك لەوانەی کە ئاگری بۆ هڕدەدەن مەبەستتان ئەوەیە کە بیکەن بەخشڵ بۆ ئافرەتان‌و پیاوان‌و خۆیانیان پێ جوان بکەن یان کەل‌و پەلێکن تەنها بۆرابواردن وەك دروستکردنی ئاسن‌و سەیارەو جۆرەها دەستگای گەورەو بچوك بۆرازاندەوەی ژیانی دنیا، هەمویان بەئاگر چڵك‌و پیسیەکانیان لێ لائەبرێت‌و پاڵفتە ئەبێ‌و سودی لێ وەئەگیرێت هەر ئاوەها خوای زاناو دانا وێنەی راست‌و ناڕاست باس ئەکات‌و سەر ئەنجامی هەردووکیانیش بەم شێوە جوانە شی ئەکاتەوەو ئەفەرموێ: جا ئەو کەفە لەناو ئەچێت‌و وشك ئەبێتەوەو بێ کەڵك ئەبێ، وە ئەوەی کە بۆ خەڵك سودی هەبێت لەسەر زەویدا ئەمێنێتەوە، واتە: بەتاڵ هەر چەند لەبەرچاودا گەورەو بەهێز بێت نامێنێت وسەرئەنجام راستی لەسەر زەویدا ئەمێنێتەوەو

۞ أَفَمَن يَعْلَمُ أَنَّمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ٱلْحَقُّ كَمَنْ هُوَ أَعْمَىٰٓ ۚ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩﴾ ٱلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ ٱللَّهِ وَلَا يَنقُضُونَ ٱلْمِيثَٰقَ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ يَصِلُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ وَيَخَافُونَ سُوٓءَ ٱلْحِسَابِ ﴿٢١﴾ وَٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً وَيَدْرَءُونَ بِٱلْحَسَنَةِ ٱلسَّيِّئَةَ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٢﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا وَمَن صَلَحَ مِنْ ءَابَآئِهِمْ وَأَزْوَٰجِهِمْ وَذُرِّيَّٰتِهِمْ ۖ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ يَدْخُلُونَ عَلَيْهِم مِّن كُلِّ بَابٍ ﴿٢٣﴾ سَلَٰمٌ عَلَيْكُم بِمَا صَبَرْتُمْ ۚ فَنِعْمَ عُقْبَى ٱلدَّارِ ﴿٢٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهْدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقْطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ ﴿٢٦﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْلَآ أُنزِلَ عَلَيْهِ ءَايَةٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِىٓ إِلَيْهِ مَنْ أَنَابَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَتَطْمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكْرِ ٱللَّهِ ۗ أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ ﴿٢٨﴾

جێگیر ئەبێ، جا هەر ئاوەها خوای دانا وێنەکان باس ئەکات تا ئێوە سودی لێ وەربگرن . ئینجا ﷲ لە پاداشی باوەڕداراندا دەفەرموێ:

﴿١٨﴾ بۆ ئەو کەسانەی کە وەڵامی پەروەردگاری خۆیان داوەتەوەو باوەڕیان پێ هێناوەو بەندایەتی ئەو زاتە دەکەن بەهەشتیان پێ ئەدرێت‌و ئەوانەی وەڵامی ئەویان نەداوەتەوەو باوەڕیان پێ نەهێناوە ئەگەر ئەوەی کە لە زەویدایە موڵکی ئەوان بوایەو ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بوایە هەمویان ئەدا بۆ ئەوەی کە رزگار بونایە لە سزای ڕۆژی دوایی، جا ئاشکرایە کە نە ئەوەیان هەیەو ئەگەر ئەوەشیان ببوایە هەرگیز لێیان وەرنەئەگیرا بەڵکو بۆ ئەوان لەو کاتەدا خراپترین گێرەو کێشە هەیەو رزگاریان نابێ‌و جێگایان دۆزەخەو دۆزەخیش پیسترین جێگایە. جارێکی تر پەروەردگاری میهرەبان نمونەیەکی باوەڕدارو بێ باوەڕ باس ئەکات‌و ئەفەرموێ:

﴿١٩﴾ئایا ئەوکەسەی کە ئەزانێت ئەوەی کە ڕەوانەکراوە بۆ لای تۆ لەلایەن پەروەردگارتەوە حەق‌و راستە وەك ئەو کەسەیە کە کوێرەو هیچ حەقیقەت‌و راستیەك نابینێ؟ بەراستی بیر لەم راستیانەناکاتەوە مەگەر ئەو کەسانەی کە خاوەنی ژیری‌و عەقڵ بن، جا پەروەردگار زیاتر پێناسەی ئەو مرۆڤە ژیرانەمان بۆ ئەکات‌و ئەفەرموێ:

﴿٢٠﴾ئەوانەکەسانێکن کەبەڵێنی خۆیان لەگەڵ خوادا بەڕێك وپێکی ئەبەنە سەرو ئەو عەهدو پەیمانە ناشکێنن.

﴿٢١﴾ئەو کەسانەی کە ئەیلکێنن بەیەکەوە ئەو شتەی کەخوا دەستوری داوە بلکێت بەیەکەوە، واتە: پەیوەندی خزمایەتی نابچڕێنن، وەئەترسن لە پەروەردگاری خۆیان‌و ئەترسن لەعاقیبەتی خراپەو گێرەو کێشەی سەختی ڕۆژی دوای، هەروەها ئەو ژیرانە،

﴿٢٢﴾ ئەوانەن کە لەبەر ڕەزاو ڕەحمەتی خوا لەسەر بەندایەتی‌و خۆپاراستن لەتاوان‌و گرفتاری‌و تەنگوچەڵەمەکانی دنیا خۆیان گرتوەو نوێژەکانیان بەڕێك وپێکی ئەنجام داوەو لەوەی کە پێمان داون بەنهێنی‌و بەئاشکرا ئەبەخشن، وەهەمیشە بەچاکەکردن خراپەکانیان لادەبەن، جا بۆ ئەوان ماڵ‌و ئایندەیەکی جوان هەیە کە بریتیە لە بەهەشت‌و ئەو هەمو نازو نیعمەتانەی کە لەناویدایە. ئەوانەی کە پەیرەوی لەو فەرمانەی پێغەمبەرمانﷺ دەکەن کە دەفەرموێ: {اتقِ ا حَيْثُمَا كُنْتَ وَأَتْبِعْ السيئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا وَخَالِقِ الناسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ. /الترمذي، حسنه الالبا / لەخوا بترسن لەهەرکوێدا هەن وبەدوای خراپەکاندا چاکە بکەن کە خراپەکان لەناو دەبات، وە بە جوانی لەگەڵ خەڵك دا بجوڵێنەوە} ئەوانە خاوەنی ئەو بەهەشتەن کە (ﷲ) تاریفی دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٢٣﴾ بەهەشتانێکی شوێنی دانیشتن‌و حەسانەوەن کە ئەچنە ناویەوە خۆیان‌و هەمو ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئیشی چاکیان کردوە لەباوو باپیرانیان‌و لەهاوسەران‌و لە منداڵانیان‌و هەمویان لەوێدا کۆ دەبنەوە بەخۆشی‌و شادمانی‌و فریشتەکانیش لەهەمو دەرگایەکەوە دێنە لایان،

﴿٢٤﴾سەلامیان لێ دەکەن‌و مژدەی ئەمن‌و ئاسایشیان پێ ئەدەن‌و پێیان ئەڵێن: ئەم ڕێزەتان بەهۆی ئەوەیە کە خۆتان راگرتوە لەسەر بەندایەتی‌و دوورکەوتنەوە لەتاوان‌و رازی بون بەبڕیاری خوای خۆتان لەسەر تەنگو چەڵەمەکانی ژیان لەبەر ئەوە خوای میهرەبان ئەم نازو نیعمەتە فرەوانەو ئەم جێگا خۆشەی پێداون بەراستی باشترین عاقیبەت وسەرەنجامە ئەو ماڵە کە بەهەشتە. لەفەرمودەیەکدا هاتوە کە پێغەمبەرمان ﷺ ئەفەرموێ{هَلْ تَدْرُونَ أولَ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنةَ مِنْ خَلْقِ ا قَالُوا ا وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ أولُ مَنْ يَدْخُلُ الْجَنةَ مِنْ خَلْقِ ا الْفُقَرَاءُ وَالْمُهَاجِرُونَ الذِينَ تُسَد بِهِمْ الثغُورُ وَيُتقَى بِهِمْ الْمَكَارِهُ وَيَمُوتُ أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لَا يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً فَيَقُولُ ا عَز وَجَل لِمَنْ يَشَاءُ مِنْ مَلَائِكَتِهِ ائْتُوهُمْ فَحَيوهُمْ فَتَقُولُ الْمَلَائِكَةُ نَحْنُ سُكانُ سَمَائِكَ وَخِيرَتُكَ مِنْ خَلْقِكَ أَفَتَأْمُرُنَا أَنْ نَأْتِيَ هَؤُلَاءِ فَنُسَلمَ عَلَيْهِمْ قَالَ إِنهُمْ كَانُوا عِبَادًا يَعْبُدُونِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا وَتُسَد بِهِمْ الثغُورُ وَيُتقَى بِهِمْ الْمَكَارِهُ وَيَمُوتُ

ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ طُوبَىٰ لَهُمۡ وَحُسۡنُ مَـَٔابٖ ﴿٢٩﴾ كَذَٰلِكَ أَرۡسَلۡنَٰكَ فِيٓ أُمَّةٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهَآ أُمَمٞ لِّتَتۡلُوَاْ عَلَيۡهِمُ ٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِۚ قُلۡ هُوَ رَبِّي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ مَتَابِ ﴿٣٠﴾ وَلَوۡ أَنَّ قُرۡءَانٗا سُيِّرَتۡ بِهِ ٱلۡجِبَالُ أَوۡ قُطِّعَتۡ بِهِ ٱلۡأَرۡضُ أَوۡ كُلِّمَ بِهِ ٱلۡمَوۡتَىٰۗ بَل لِّلَّهِ ٱلۡأَمۡرُ جَمِيعًاۗ أَفَلَمۡ يَاْيۡـَٔسِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَهَدَى ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۗ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ تُصِيبُهُم بِمَا صَنَعُواْ قَارِعَةٌ أَوۡ تَحُلُّ قَرِيبٗا مِّن دَارِهِمۡ حَتَّىٰ يَأۡتِيَ وَعۡدُ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَأَمۡلَيۡتُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ ثُمَّ أَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٣٢﴾ أَفَمَنۡ هُوَ قَآئِمٌ عَلَىٰ كُلِّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۗ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ شُرَكَآءَ قُلۡ سَمُّوهُمۡۚ أَمۡ تُنَبِّـُٔونَهُۥ بِمَا لَا يَعۡلَمُ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَم بِظَٰهِرٖ مِّنَ ٱلۡقَوۡلِۗ بَلۡ زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ مَكۡرُهُمۡ وَصُدُّواْ عَنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾ لَّهُمۡ عَذَابٞ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَشَقُّۖ وَمَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴿٣٤﴾

**أَحَدُهُمْ وَحَاجَتُهُ فِي صَدْرِهِ لَا يَسْتَطِيعُ لَهَا قَضَاءً قَالَ فَتَأْتِيهِمُ الْمَلَائِكَةُ عِنْدَ ذَلِكَ فَيَدْخُلُونَ عَلَيْهِمْ مِنْ كُلِّ بَابٍ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ بِمَا صَبَرْتُمْ فَنِعْمَ عُقْبَى الدَّارِ/** ( دوغ ٥، صححه الالبا ) / ئایا دەزانن کێ ئەوڵ کەسێکە کە ئەچێتە بەهەشتەوە لە دروستکراوەکانی خوا؟ وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەزانن فەرموی: ئەو کەم دەستانەو کۆچکەریانەن کە سنورەکانی وڵاتی ئیسلامییان پاراستوەو بەوان نارەحەتیو کۆسپ لابراوە، جا کەسی وایان هەبوە کە مردوە گەلێك ئیشی دنیایی بوە لەبەر ئەو ئەرکانەی جیهاد بۆی ئەنجام نەدراوە جا ﷲ دەفەرموێ: بەو کەسانەی کە ئارەزۆی لێ بێت لە فریشتە کانی بڕۆن بۆ لایان و سەلامیان لێ بکەن جا فریشتەکانیش دەڵێن: ئێمە نیشتەجێی ئاسمانەکانین و چاکترین دوروستکراوی تۆین ئایا فەرمانمان پێ دەدەیت کە بچین بۆ لای ئەوان و سەلامیان لێ بکەین؟!

ﷲ دەفەرموێ: ئەوانە بەندە گەلێکی منن کە بەندایەتیان بۆ من کردوەو هیچیان بۆ من نەکردوە بە هاوبەش و بەوانیش سنورەکانی وڵاتی ئیسلامییان پاراستوەو نارەحەتیو کۆسپ لابراوە، جا کەسی وایان هەبوە کەمردوە لەحاڵێکدا کە ئیش و مەبەستانێکیان لە دڵدا بوە کە نەیانتوانیوە جێبەجێ بکەن، جا لە پاداشی ئەو زەحمەتەیاندا فریشتەکان لە هەمو دەرگاکانی بەهەشتەوە دێنە لایان و سەلامیان لێ دەکەن و دەڵێن –ئەمە بەهۆی خۆڕاگریتانەوەیە بەراستی چاکترین پاشەڕۆژتان دەست کەوتوە}

ئینجا خوای زاناو دانا لە پاش ئەوەی کە باسی باوەڕداران و چاکەکانیان و پاشەڕۆژیانی کرد باسی بێ باوەڕان و پاشەڕۆژی خراپەکانیان ئەکات و ئەفەرموێ :

﴿٢٥﴾ئەوسا ئەوانەی کە پەیمانی نێوان خۆیان و خودا هەڵ ئەوەشێننەوە پاش ئەوەی کە بەسوێند ئەو پەیمانەیان بتەوو بەهێز کردوەو پەیوەندی خزمایەتی و هەر شتێکی تر کە خوا فەرمویەتی بیانلکێنن بەیەکەوە وەك باوەڕهێنان بەهەمو پێغەمبەران دەبچڕێنن وخراپە بڵاوئەکەنەوە لەسەر زەویدا بۆ ئەوانە نەفرین و لەعنەتی خواو پاشەڕۆژو ماڵێکی خراپیان هەیە، جالە بەر ئەوەی کە بێباوەڕان بەزۆری لە ژیانی دنیادا بەهرەمەندن و بارودۆخی ژیانیان خۆشترە ئەوە بەهۆی ژیریو لێزانی و چاکی خۆیان ئەزانن بۆیەخوای زاناو دانا رایان دەچڵەکێنێ و ئەفەرموێ:

﴿٢٦﴾ هەر خوایە بژێوی فرەوان ئەکات بۆ ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێ وئەیگرێتەوە لەوکەسەی کە ئارەزۆی لێ بێ، واتە: فرەوانی سەروەت و سامان یان کەمی بەڵگەی چاکی و ناچاکی یان ژیریو نەزانی نیە، بەڵکو ئەوە بڕیارێکی خوایەو هەر خۆی ئەزانێ بۆچی وادەکات، بەڵام بێ باوەڕان زۆر زوو لەخۆ بای ئەبن و کەیفخۆش و لەخۆبایی بەژیانی دنیا جا ﷲ باسی بێ نرخی ژیانی ئەم دنیایە ئەکات و ئەفەرموێ: خۆژیانی دنیا لەچاو ژیانی قیامەتدا تەنها نەختێك رابواردنەو بەس .

﴿٢٧﴾ جا بێباوەڕان ئەڵێن ئەگەر راستە محمد ﷺ پێغەمبەری خوایە بائایەت و نیشانەیەکی لەلایەن پەروەردگاریەوە بۆ بهاتایە وەك ساڵح و موساو عیسا. جا خوا دەمکوتیان ئەکات و ئەفەرموێ پێیان: بڵێ بەراستی خوا گومڕاوو سەرلێشێواو ئەکات ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت و هیدایەت و ڕێنماییش ئەکات ئەوکەسەی کە خۆی بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە، واتە: ﷲ بەزۆر نەکەس گومڕا دەکات و نە کەس ڕێنمای دەکات چونکە هاتنی ئێمە بۆ ئەم ژیانە بۆ تاقی کردنەوەیە و ئەگەر زۆری کرد بۆ هەر لایەکیان ئیترسود لەم هاتنەماندا نامێنێت، بەڵکو یارمەتی ﷲ بەسراوە بەئیرادەی مرۆڤەوە هەرکاتێك مرۆڤ ئیرادەی کرد خوایش ئەگەر ویستی یارمەتی دەدات بەڵام پاداشت و سزا لەسەر ئیرادەی مرۆڤەکەیە کەوابو ئەگەر ﷲ شتێکی بە مرۆڤ کرد بەبێ ئیرادەی مرۆڤ ئەوکاتە بێتاوان دادەنرێت و بگرەو بەردەیشی لەسەر نییە.

(٢٨) ئەو کەسانەی کە بۆ لای خودا دەگەڕێنەوە ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوەو هەمیشە بەیادی خوا دڵەکانیان ئارام دەگرێت، ئاگاداربن بەیادی ﷲ دڵەکان ئارام دەگرن کە خوێندنی قورئان بەشێکی گرنگە لەو یادەی ﷲ و بەورد بونەوە لێی‌و بیرکردنەوە لەماناوزانیارییەکانی بەراستی دڵەکان ئارام دەگرن جا ئەو دڵەی کەبە قورئان‌و یادی خوا ئارامی نەگرت با خاوەنەکەی بترسێت لە خۆی کە دڵەکەی دڵێکی باوەڕدارانەنیە. ئینجا سەبارەت بەپاداشتی باوەڕداران ئەفەرموێ:

(٢٩) ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە خۆشبەختی هەربۆ ئەوانەو باشترین جێگایشیان هەیە. ﴿طُوبَىٰ﴾ واتە: خۆشبەختی یان درەختێکە لە بەهەشتدا کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { طُوبَى شَجَرَةٌ فِي الْجَنَّةِ مَسِيرَةَ مِائَةَ عَامٍ ثِيَابُ أَهْلِ الْجَنَّةِ تَخْرُجُ مِنْ أَكْمَامِهَا / احمد، حسنه الالبانی / توبا درەختێکە لەبەهەشتدا کە ڕۆیشتن لەژێر سێبەری ئەودرەختەدا سەد ساڵە بەسواری و پۆشاکی خەڵکی بەهەشت لەناو توێکوڵی ئەم درەختەوە دەرئەچێت}کە ئەم درەختە بۆخاوەن باوەڕانە.

(٣٠) هەر ئاوا ئەی محمدﷺ تۆمان ڕەوانە کرد بۆناو گەلێك کەلە پێش ئەوان دا چەندین گەلی تر ڕۆیشتون، واتە: تۆ شتێکی داهاتوو بێ وێنە نیت کە ئەوان لێت بکەونە گومانەوە بەڵکو پێش تۆش ئەو هەمو پێغەمبەرانە هەبون، جا تۆمان ڕەوانە کردوە بۆ ئەوان تا بخوێنیتەوە بەسەر ئەواندا ئەوەی کە ئێمە وەحیمان کردوەتە لاتو قسەی ئێمەیە بۆ ئەوان نە قسەی تۆ بەڵام لە ڕاستیدا ئەوانە بەهانە ئەگرن‌و بێباوەڕن بەو زاتەی کە زۆر بەسۆزو میهرەبانە، لێرەدا بەوشەی(الرحمن) ناوی خوا هاتوە تا بەڵکو بێباوەڕان بیر بکەنەوەو خۆیان لەو زاتە دور نەخەنەوەو ئومێدی بەخشینیان پێ ئەدات ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای. ئەی محمدﷺ پێیان بڵێ ئەو زاتە ڕەحمانەو پەروەردگاری منەکە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە بێجگە لەوو هەر تەنها بەو پشت دەبەستم‌و گەڕانەوە تەنها بۆلای ئەو زاتەیە، هەرچی ببیٰ‌و هەرچی بکەیت‌و لە هەر کوێدا ببیت ئەبێ بگەڕێیتەوە بەردەم دادگای ئەو زاتە. وشەکانی (متاب،مثاب،مآب) بەمانای گەڕانەوە دێن‌و لێرە ئەو مانایە مەبەستە والله اعلم. ئینجا خوای زاناو دانا وەسفی ئەم قورئانە ئەکات‌و ئەفەرموێ:

(٣١) خۆ ئەگەر قورئانێك بوایە کە چیاکانی پێ ببرایە بەڕێوەو هاتو چۆی پێ بکردنایە یان زەوی بەو لەت بکرایە یان قسەی لەگەڵ مردودا پێ بکرایە بەدڵنیاییەوە ئەم قورئانە ئەوەی دەکرد بەڵام ئێمە ئەم قورئانەمان زۆرلەوە زیاتری کردوە چونکە ئەم قورئانە پلەو پایەو موعجیزەکانی زۆر گەورەو گرنگترە لەوانەی پێش خۆی، پێغەمبەرێکی نە خوێندەوار ڕەوانترین پەڕاو بهێنێ کە هیچ ڕەوان بێژێك نەتوانێ بەوێنەی ئەو سورەتێك بهێنێ چی تر هەیە لەوە گرنگترو موعجیزەتر کەچی ئێوە لاساری ئەکەن‌و باوەڕی پێ ناهێنن؟ جا چونکە قسەکانیان بێ نرخە خوا ئەفەرموێ: واز بێنە لەو باسە، هەمو کارو بار تەنها بەدەست خودایەو لەژێر چاودێری ئەودا دەجوڵێتەوە چی ئارەزۆ بکات وا ئەبێ‌و دنیایش بۆ تاقی کردنەوەیەو هەرکەس دەرچوو لەو تاقی کردنەوەدا خۆش بەختەو هەرکەسیش دەرنەچوو خۆی‌و خاو خێزانی خۆی دۆڕاندوە، ئینجا خوا ئەفەرموێ: ئایا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە نازانن کە ئەگەر خودا ئارەزۆی لێ بێ هەمو خەڵکی ڕێنمایی ئەکات‌و بەبەهەشتی ئەگەیەنێ؟ ئەوانەی کەکافرن لەدنیادا هەمیشە بەهۆی ڕەفتارە خراپەکانیانەوە دوچاری بەڵاو موسیبەت دەبن یان لە نزیکەوە سزاو تۆڵە ئەبینن کە توشی کەسانی تر دەبێت، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو واز لەتاوان‌و بێباوەڕی بهێنن بەڵام ئەوان لەم ڕوداوە گرنگانەدا کەڕو کوێرو گەمژەن‌و هیچ سودێك وەرناگرن هەتا بەڵێنی خودا دێتە دی بۆیان‌و هەمو کەسێك ئەمرێت، جا ئەوسا ئەزانن چییان لێ قەوماوەو چ زیانێکیان کردوە. بەڵێ هاتنی مەرگ بۆ هەمو کەس بەڵێنی خودایەو بێگومان کە ﷲ پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات، واتە: با باوەڕداران لە دەسەڵات‌و هێزی بێباوەڕان نەترسن‌و بەشتێکی گرنگی نەزانن چونکە دنیا وەك وتمان بۆ تاقی کردنەوەیەو ﷲ کەس بەزۆر ناکات بەباوەڕدار بەڵکو سەر پشکی کردوە لە هەڵبژاردنی بەرنامەی خۆیدا تا لە دوا ڕۆژدا بەهانەی نەمێنێ، جێگای بەهەشتە یان دۆزەخ بەگوێرەی ڕەفتاری خۆیەتی. جا خوا دڵخۆشی پێغەمبەرمانﷺ ئەکات کە ناڕەحەت مەبە کە بەچاوی سووکەوە تەماشا دەکرێیت‌و گاڵتەت پێ دەکرێت چونکە تۆ تەنها نیت‌و ئەفەرموێ:

(٣٢) بەراستی لە پێش تۆدا گاڵتە کرا بەپێغەمبەران جا من مۆڵەتم دا بەکافران کە خراپەیان دەکردو وایان بیر ئەکردەوە کە شایستەی ژیانن‌و پیاو چاکن‌و ماف پەروەرن بۆیە خوا زوو تۆڵەیان لێ وەرناگرێت!! لە پاشان ئەوانم گرت‌و تۆڵەم لێ کردنەوە، جا تەماشا بکەن‌و بزانن تۆڵەی من چۆنەو چیم کرد بەئەوانەی کە لایاندابو لە بەرنامەی من لە گەلی نوحەوە بگرن تا گەلی لوت، وە فیرعەون بۆ کوێ چوو چی بەسەرهات؟ ئایا هیچ کامیان توانیان بەرگری لە سزای خودا بکەن؟ دەی بۆ ئەمڕۆ ئێوەش بیر ناکەنەوە؟!

۞ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ أُكُلُهَا دَآئِمٞ وَظِلُّهَاۚ تِلۡكَ عُقۡبَى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْۖ وَّعُقۡبَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ٱلنَّارُ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَۖ وَمِنَ ٱلۡأَحۡزَابِ مَن يُنكِرُ بَعۡضَهُۥۚ قُلۡ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشۡرِكَ بِهِۦٓۚ إِلَيۡهِ أَدۡعُواْ وَإِلَيۡهِ مَـَٔابِ ﴿٣٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ حُكۡمًا عَرَبِيّٗاۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعۡتَ أَهۡوَآءَهُم بَعۡدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡعِلۡمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا وَاقٖ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلٗا مِّن قَبۡلِكَ وَجَعَلۡنَا لَهُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَذُرِّيَّةٗۚ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأۡتِيَ بِـَٔايَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ لِكُلِّ أَجَلٖ كِتَابٞ ﴿٣٨﴾ يَمۡحُواْ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثۡبِتُۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٣٩﴾ وَإِن مَّا نُرِيَنَّكَ بَعۡضَ ٱلَّذِي نَعِدُهُمۡ أَوۡ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ ٱلۡبَلَٰغُ وَعَلَيۡنَا ٱلۡحِسَابُ ﴿٤٠﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَاۚ وَٱللَّهُ يَحۡكُمُ لَا مُعَقِّبَ لِحُكۡمِهِۦۚ وَهُوَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٤١﴾ وَقَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَلِلَّهِ ٱلۡمَكۡرُ جَمِيعٗاۖ يَعۡلَمُ مَا تَكۡسِبُ كُلُّ نَفۡسٖۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلۡكُفَّٰرُ لِمَنۡ عُقۡبَى ٱلدَّارِ ﴿٤٢﴾

(٣٣) ئایا ئەو کەسەی کە ئاگای لە هەمو نەفسێك هەیە، وەك ئەو کەسە وایە کە ئاگای لە هیچ نیە، نەخێر وەك یەك نین، سەبارەت بەو هەموو راستیو حەقیقەتەی کە ئەیبیستنو ئەی بینن کەچی ئەوان زیاتر لارێ ئەبن. وەئەوان هاوبەشانێك بۆ خوا دائەنێن، پێیان بڵێ : ئەگەر راست ئەکەن ناویان ببەن، ئەمە هەرەشەکردنە لەوبت پەرستانە، جا هەرەشەی توندتریان لێ ئەکاتو ئەفەرموێ: واز لەوە بێنە، ئایا ئێوە شتێك بەخوا رادەگەیەنن لەم سەر زەویەدا کەخوا خۆی نایزانێت؟ واتە: خوا خۆی ئەزانێ کە شەریکی نیە بەڵام ئێوە پێی رادەگەیەنن کە شەریکت هەیە؟! واز لەوەش بهێنە، ئایا بەرواڵەتو قسەی پوچ خۆتان فریوداوەو ئەڵێن ئەو بتانە سودیان هەیەو هاوبەشی خودان؟ واز لەوەش بهێنە، بەراستی جوان کراوە بۆ کافران فرو فێڵەکانیانو بەهۆی کوفریانەوە بەرگری کراون لە رێگای خودا، وەئەو کەسەی کە ﷲ گومراهی بکات ئیتر کەسی تر نیە رێنمای بکات، مادام ئەوان بەکەیفی خۆیان بەرەو فەساد رۆیشتن خوایش گومراهی کردنو هەر کەسێکیش کە خوا گومراهی بکات هەرگیز رێگای راستو دروست نادۆزێتەوە، جا خوا باسی سزای کافران دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٤) سزا هەیە بۆ ئەوان لە ژیانی دنیاداو سزای پاشە رۆژ زۆر زۆر بەهێزترو سەخترەو بۆ ئەوان پاڵپشتێك نیە لە سزای خودا بیان پارێزێتو نەیەڵێ سزا بدرێن، جاپاش باسی سزای کافرو بێباوەڕان ئاوەڕێك ئەداتەوە بۆ لای پاداشی باوەڕدارانو دەفەرموێ:

(٣٥) وێنەی ئەو بەهەشتەی کە بەڵێن دراوە کە بدرێت بە پارێزکاران، باغو بێستانێکە کە لەژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگا لە ئاوو هەنگوین وشیرو شەراب ئەڕوات (ئەم چوار روبارە لە سورەتی محمد ﷺ دا باسکراون)کە خواردنەکەی هەمیشەییەو سێبەرەکەشی هەروا هەمیشەییە دیارە لەوێ خۆرو مانگ نیە بەڵام روناکی بەهەشت وەك روناکی پێش خۆرکەوتنی بەیانیەو خۆشیو چۆنیەتی سێبەرەکەی هەر لەوێ ئەزانرێت، سا خوا بیکات بەنسیبمان، ئەوەیە عاقیبەتی ئەو کەسانەی کە پارێزکارنو لە خوا ئەترسن، وە عاقیبەتی کافران دۆزەخە، جا خوا لە وەسفی ئەوکەسانەی کەباوەڕیان بەقورئان هێناوە ئەفەرموێ:

(٣٦) جا ئەوانەی کە ئێمە پەڕاومان پێ داون وەك هەندێك لە جووەکان و هەندێك لە فەلەکان شادمانو کەیفخۆشن بەوەی کە رەوانەمان کردوەتە لای تۆ، چونکە زانیاری پێشویان لەسەر تۆ بوەو ئێستە ئەزانن کە تۆ پێغەمبەری خوایتو باوەڕیان پێ هێناوە وەکو عەبدوڵای کوڕی سەلام، وە هەندێك لەو کۆمەڵانە دژایەتی بەشێك لەو قورئانە ئەکەن بۆ نمونە: ئەم قورئانە عیسا بەپێغەمبەر ئەزانێو ئەڵێت ئەو بتانە بێ کەڵکن کەچی جولەکە عیسا بەپێغەمبەر نازانێو تانەو تەشەری خراپیشی لێ ئەدەنوبت پەرستانیش بتەکانیان خۆش ئەوێو بەشتیان ئەزانن، جا خوا فەرمان ئەکات بە پێغەمبەرمانﷺ و ئەفەرموێ: ئەی محمدﷺ بڵێ: فەرمانم پێ کراوە کەمن خودا بپەرستم وهاوەڵی بۆ دانەنێم کە من تەنها بۆ لای ئەو خەڵکی بانگ دەکەمو هەر بۆ لای ئەوە گەڕانەوە. چی بکەیتو چی بیت سەرئەنجام ئەبێ بچیتەوە بەردەم خودای خاوەن دەسەڵاتو زانا هەرکەس پاداشو تۆڵەی خۆی وەر ئەگرێت بێ ئەوەی ستەمێك لە کەس بکرێت، کەواتە بانگ بۆ لای خواو بەرنامەکەی ئیشێکی ژیرانەو سود بەخشەو هیوای خۆش بەختی لێ ئەکرێت.

(٣٧) هەروەکو چۆن پەڕاومان نارد بۆ لای پێغەمبەرانی پێشو هەر ئاوەها ئەو قورئانەمان ناردە لای تۆ کە بەرنامەو فەرمانێکە بە زمانی عەربیو تۆیشمان بەو قورئانە پایەبەرزو رێزدار کرد، جا ئەی محمد ئەگەر بێتو تۆ دوای ئارەزۆکانی ئەوان بکەویت

پاش ئەوەی کەئەم حەقیقەتو زانیاریانە هاتوەتە لات ئیتر ئەبێ تۆیش چاك بزانی کە ئەو کاتە لەلایەن خواوە هیچ یارمەتی دەرو دۆستێکت نیە کە یارمەتیت بداتو هیچ پارێزەرێکیشت نیە کە بت پارێزێت لە سزاو تۆڵەی خوا.

ئەمە هەڕەشەیەکە لەپێغەمبەرمان ﷺ کەمەبەست ئێمەی ئوممەتی ئەو پێغەمبەرەین ﷺ ئەگینا پێغەمبەری خوا نەلای داوەو نەتابیعی ئەوانیش دەبێت. ئینجا لە وەڵامی ئەوانەدا کە رەخنەی ژن هێنانیان لە پێغەمبەر ﷺ ئەگرت ئەفەرموێ:

(٣٨) بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانێکی زۆرمان لەپێش تۆدا رەوانە کردوە کەئەوانیش بەشەر بوونوئەوەی کە خوا بۆی حەلاڵ کردون لە خواردنو ژن هێنان ئەنجامیان داوەو هاوسەرو منداڵیان بوە، کەواتە بۆچی ئەوان ئەم رەخنە بێ نرخانە ئەگرن بەتایبەت جولەکە ئەڵێت من نەوەی ئیبراهیمم ئەگەر ئیبراهیم خێزانی نەبوە نەوەکەی هی چییە؟ وە هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێت خۆی بۆ خۆی موعجیزەیەك بهێنێت مەگەر خوا ماوەی پێ بداتو بۆی ئەنجام بدات، ئەوسا بۆ هەمو ماوەیەکیش نوسراوی تایبەت هەیە تا ئەوکاتە نەیەت ئەو شتە ڕونادات.

(٣٩) جا خوا لەناوی ئەباتو ئەی سڕێتەوە ئەو شتەی کە ئارەزۆی لێ بێتو دای ئەمەزرێنێو بتەوی دەکات ئەو شتەی کە ئارەزۆی لێ بێتو بنەڕەتو سەری پەڕاوەکە لەلای خۆیەتی، واتە: ئەوگۆڕانکاریانە لەبەرچاوی ئێمەو فریشتەکانە ئەگینا بڕیاری سەرکی خوا گۆڕانکاری تێدا نابێتوبە گوێرەی زانیاری خۆی چی تۆمارکردوە لە "لەوحولمەحفوز"دا هەر ئەوە ئەبێ بەبێ زیادو کەم، ئینجا خوا ڕووئەکاتە پێغەمبەرمان ﷺ و ئەرکی سەرشانی بۆ ڕۆشن ئەکاتەوەو ئەفەرموێ:

(٤٠) خۆ ئەگەر ئێمە هەندێك لەو سزایانەی کە بەڵێنمان پێداون لە کاتی بونی تۆدا جێ بەجێی بکەینو ئەو سزایە پیشانی تۆ بدەین کە زیاتر تۆ دڵخۆش ببی یان تۆ بمرێنین پێش ئەوەی کەسزایان بدەین لای ئێمە یەکسانەو پەیوەندی بەتۆوە نیە چونکە تۆ تەنها گەیاندنی ئەم پەیامەت لەسەرە وبگرەو بەردەو حیساب لە سەر ئێمەیە.

(٤١) ئایا کافران نابینن کە ئێمەئەو زەوییەی ئەوان هەمیشە کەم ئەکەینەوەو ئەیدەینەدەست باوەڕداران؟ وە خەڵکی باوەدار نابینن کە ئێمە هەمیشە زاناو هەڵکەوتوانیان دەبەینەوە لای خۆمانو ئەوان کەم ئەکەینەوە؟ واتە: مادام ئەوان لەم بارەوە

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَسْتَ مُرْسَلٗاۚ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدَۢا بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ وَمَنۡ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡكِتَٰبِ ﴿٤٣﴾

## سُورَةُ إِبۡرَاهِيمَ ١٤ — ٥٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓرۚ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿١﴾ ٱللَّهِ ٱلَّذِي لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۢ بَعِيدٖ ﴿٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوۡمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمۡۖ فَيُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٤﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنۡ أَخۡرِجۡ قَوۡمَكَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٥﴾

هیچیان پێ ناکرێت ئەبوایە بەجوانی گەردنکەچ بونایەو بەتەواوی و بەدڵسۆزییەوە بەندایەتی خوایان بکردایەو لەو بترسنایە چونکە خوا دروستیکردونو هەر خوایش حوکم ئەکاتو هیچ کەسێك ناتوانێت حوکمی دوا بخاتو هەر ئەوە زۆر زۆر بەپەلەیە لە لێکۆڵینەوەو حیسابدا.

(٤٢) لە پێش ئەم گەلەی تۆدا ئەی محمدﷺبەڕاستی کافران فڕوفێڵی خۆیان کردوە بەڵام بەو فڕوفێڵانەیان بەجێگایەك نەگەیشتونو زیاتر ئەو فڕو فێڵانەیان بووەتە هۆی لەناوچونی خۆیان چونکە هەمو فڕوفێڵێك لە ژێر چاودێریو بڕیاری خوادایەو ناتوانرێت بەبێ ئارەزۆی ئەو هیچ شتێك بکرێتو بەڵێنیشی داوە کە فڕوفێڵی بێباوەڕان پوچەڵ بکاتەوە کە ئەو ئەزانێت هەرکەسێك خەریکی چییەو چی ئەکات بەم زووانە کافران ئەزانن عاقیبەتی خۆشبەختیو خانوی چاك بۆ کێیە.

(٤٣) جا ئەوانەی کە کافرن ئەڵێن: تۆ پێغەمبەر نیتو باوەڕت پێ ناکەن جا تۆش بڵێ: خوا بەسە کەشایەت بێت لە نێوان منو ئێوەدا کەمن رەوانە کراوی ئەومو ئەوکەسەش کە زانیاری پەڕاوی هەیە ئەزانێ کەمن پێغەمبەری خوامو ئەوەندەش بەسە بۆمن.

وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ أَنجَىٰكُم مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَسُومُونَكُمۡ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ وَيُذَبِّحُونَ أَبۡنَآءَكُمۡ وَيَسۡتَحۡيُونَ نِسَآءَكُمۡۚ وَفِي ذَٰلِكُم بَلَآءٞ مِّن رَّبِّكُمۡ عَظِيمٞ ﴿٦﴾ وَإِذۡ تَأَذَّنَ رَبُّكُمۡ لَئِن شَكَرۡتُمۡ لَأَزِيدَنَّكُمۡۖ وَلَئِن كَفَرۡتُمۡ إِنَّ عَذَابِي لَشَدِيدٞ ﴿٧﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكۡفُرُوٓاْ أَنتُمۡ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٨﴾ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَبَؤُاْ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا ٱللَّهُۚ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَرَدُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ فِيٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَقَالُوٓاْ إِنَّا كَفَرۡنَا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ وَإِنَّا لَفِي شَكّٖ مِّمَّا تَدۡعُونَنَآ إِلَيۡهِ مُرِيبٖ ﴿٩﴾ ۞ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾

## ١٤ سورەتی ئیبراهیم ٥٢

سورەتی ئیبراهیم کە سورەتی چواردەهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، پەنجاو دوو ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی حەفتاهەمینەو پاش سورەتی (الشورى)و پێش (الأنبياء) دابەزیوە. ناوی پێغەمبەر ئیبراهیم ﷺ کە بە باوکی پێغەمبەران دەناسرێت شەستو نۆجار لە بیستو پێنج سورەتی قورئاندا هاتوە. لەم سورەتەدا یەکجار ئەویش لە ئایەتی سی وپێنجەمدا هاتوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ ئەلیف لام را. ئەمە کتابێکە ئێمە رەوانەمان کردوە بۆ لای تۆ ئەی محمدﷺتا تۆش خەڵکی لە تاریکیەکانی گومڕاهیو کوفرو نەفامی رزگار بکەیتو بیانهێنی بۆ ناو رووناکی ئایین بەبڕیاری پەوەردگاری خۆیان ورێنماییان بکەیت بۆ رێگای ئەو زاتەی کە خاوەنی دەسەڵاتەو سوپاسکراوە لە ئاسمانان ولەناو زەویدا کە بالادەستی نییەو نیازی بەکەس نییە.

﴿٢﴾ ئەوخوایەی کە موڵکی ئەوە ئەوەی کە لە ئاسمانانو زەویدایە جا بەد بەختیو روو رەشی بۆ بێ باوەڕانە لەو سزا توندەی کە بۆیان ئامادەکراوە.

﴿٣﴾ئەو کافرانەی کە ژیانی دنیایان هەڵبژاردوەو پێیان خۆشترە لە ژیانی قیامەت ورێگا لە ئایینەکەی خوا دەگرنو نایەڵن خەڵك دوای کەوێو ئایینەکەی خوا بەشێوەیەکی لارو ناشیرین پیشانی خەڵك دەدەن تا خەڵکی لەو پەشیمان بکەنەوە بەراستی ئەوانە لە گومڕاهیەکی زۆر دوور لە رستیدان، چونکە دژایەتی خواو ئایینەکەی ئەکەن، سەرەنجام دەشکێنو تارو مار دەکرێن، ئینجا ئەفەرموێ:

﴿٤﴾ ئێمە رەوانەمان نەکردوە هیچ پێغەمبەرێك بۆ هیچ گەلێك مەگەر بەزمانی گەلەکەی خۆی بێت تا حەقو راستیان بۆ رۆشن بکاتەوە جا پاش ئەوە هەرکەسێك کە خودا ئارەزۆی لێ بێ گومڕاهی ئەکاتو هەر کەسێکیشی ئارەزۆی لێ بێ رێنمای ئەکاتو هەر خۆیەتی بە دەسەلاتو دانا چی ئارەزۆی لێ بێ ئەیکاتو کەس ناتوانێ رێگای لێ بگرێت وهەرچیش ئەکات بەسودە، ئینجا بەشێوەیەکی کورت باسی موسا ﷺ ئەکاتو ئەفەرموێ:

﴿٥﴾ جا بەراستی ئێمە موسامان رەوانە کرد بەچەند ئایەتو چەند نیشانەی گەورەی خۆمان وەکو عەساکەی دەستیو گوتمان گەلەکەت رزگار بکە لەدەستی فیرعەونو داروودەستەکەیو رزگاریان بکە لە تاریکاییەکانی نەفامیو بت پەرستی بۆ رووناکی ئایینو یەکخوا پەرستیو ئامۆژگاریان بکەو بیخەرەوە بیریان ئەو هەمو نیعمەتانەی کە ﷲ رژاندی بەسەریاندا، بێگومان ئا لەمەدا چەندین بەلگەی گەورە هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە زۆر خۆگرن لەسەر بەندایەتیو دوورن لەتاوانو زۆر سوپاسی ﷲ دەکەن.

﴿٦﴾ جا بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە موسا بەگەلەکەی وت: بیر بکەنەوە لەو هەمو نیعمەتانەی ﷲ کە بە ئێوەی داوە بەتایبەت لەو کاتەدا کەﷲ لەدەستو دایەرەی فیرعەون رزگاری کردن کە خراپترین سزای دەدانو کوڕەکانتانی سەردەبڕیو ژنەکانتانی دەهێشتەوە بۆ رابواردنو لەو رووداوەدا تاقی کردنەوەیەکی گەورە بو بۆتان لەلایەن پەروەدگارتانەوە.

﴿٧﴾ بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە پەروەردگارت پێی راگەیاندنو فەرموی: ئەگەر ئێوە شوکر بکەن بەراستی زیادی ئەکەم بۆتان وئەگەر کوفری نیعمەتی من بکەن ورێزی نەگرن بەراستی سزای من زۆر توندەو هەرکات گرتنی ئیتررزگار نابن، واتە: بە سوپاسی ﷲ لەسەرنیعمەتەکانی، نیعمەتەکانی بۆتان زیاتر دەبێت بەناشوکری وسپڵەییش نیعمەتەکانی دەبرێت، جا بەم شێوەیە خوای زاناو دانا بە کورتی بەسەرهاتی جولەکەکانی باسکردو رێگای زیاد کردنی نیعمەتەکانیشی بۆ باسکردن تا بەڵکو بیر بکەنەوەو پەیڕەوی پێغەمبەری ئاخر زەمان بکەنو دژایەتی

قَالَتْ لَهُمْ رُسُلُهُمْ إِن نَّحْنُ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦ ۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأْتِيَكُم بِسُلْطَٰنٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ وَمَا لَنَآ أَلَّا نَتَوَكَّلَ عَلَى ٱللَّهِ وَقَدْ هَدَىٰنَا سُبُلَنَا ۚ وَلَنَصْبِرَنَّ عَلَىٰ مَآ ءَاذَيْتُمُونَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿١٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِرُسُلِهِمْ لَنُخْرِجَنَّكُم مِّنْ أَرْضِنَآ أَوْ لَتَعُودُنَّ فِى مِلَّتِنَا ۖ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ رَبُّهُمْ لَنُهْلِكَنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٣﴾ وَلَنُسْكِنَنَّكُمُ ٱلْأَرْضَ مِنۢ بَعْدِهِمْ ۚ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَافَ مَقَامِى وَخَافَ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ وَٱسْتَفْتَحُوا۟ وَخَابَ كُلُّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿١٥﴾ مِّن وَرَآئِهِۦ جَهَنَّمُ وَيُسْقَىٰ مِن مَّآءٍ صَدِيدٍ ﴿١٦﴾ يَتَجَرَّعُهُۥ وَلَا يَكَادُ يُسِيغُهُۥ وَيَأْتِيهِ ٱلْمَوْتُ مِن كُلِّ مَكَانٍ وَمَا هُوَ بِمَيِّتٍ ۖ وَمِن وَرَآئِهِۦ عَذَابٌ غَلِيظٌ ﴿١٧﴾ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِرَبِّهِمْ ۖ أَعْمَٰلُهُمْ كَرَمَادٍ ٱشْتَدَّتْ بِهِ ٱلرِّيحُ فِى يَوْمٍ عَاصِفٍ ۖ لَّا يَقْدِرُونَ مِمَّا كَسَبُوا۟ عَلَىٰ شَىْءٍ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٨﴾

نەکەن بەڵام ئەم جولەکانە دڵیان لەبەرد رەقتربو ئەم هەمو ئامۆژگاریو وە بیر هێنانەوە هیچ کارێکی تێ نەکردنو لە تاوانو خراپەکاری دەستیان نەکێشاوەو تائێستاش هەر بەردەوامن لەسەر پیلانوئاژاوەنانەوەدژی ئیسلامو پەیڕەوانی، ئەوتە موسایش سەلامی خوای لەسەربێ ئەوەندە ماندو بووە بەدەستیانەوە.

﴿٨﴾ موسا وتی: ئەگەر ئێوە هەموتان، وە ئەوانەش کەلەسەر زەویدان هەمویان کافربن با بزانن کە ﷲ بێ نیازو دەوڵەمەندەو سوپاسکراوە. ئەوەتە لەفەرمودەیەکی قودسی دا هاتوە کەئەگەر(هەمو مرۆڤو جنۆکە لەبەرزاییەکدا کۆ ببنەوەو هەرکەس هەرچی ئەوێ داوا لە ﷲ بکاتو ﷲ داخوازی هەمویان جێ بەجێ بکات هێچ شتێك لە موڵکی ﷲ کەم ناکاتەوە مەگەر بەئەندازەی ئەوەی کە دەرزییەك بکەیت بەناو دەریاداو دەری بهێنی چەند ئاوی ئەو دەریایە کەم ئەکاتەوە هەر ئەوەندە کەم ئەکاتەوە، بەدرێژی ئەم فەرمودەیەم لە (چل چرای ئیسلام)دا باسمانکردوە، سوپاس بۆ خوا، ئینجا ﷲ روئەکاتە ئەم گەلەی پێغەمبەرمانﷺو ئەفەرموێ:

﴿٩﴾ ئایا نەهاتوەتە لاتان دەنگوباسو خەبەری ئەوکەسانەی کەلەپێش ئێوەدا بوون وەکو گەلی نوح وعادو سەمود، وە ئەوانەی کەلە دوای ئەواندا بوون کە بێجگە لە ﷲ کەس نازانێت چەند بوون ولە کوێداو چییان کردو چییان بەسەرهاتوەو ئێستا لەو دنیادا ژیانیان چۆنە، ئەمانە هەمویان پێغەمبەرانیان بەنیشانە گەلی ئاشکراوە هاتە لا بەڵام لە جیاتی باوەڕهێنان ئەوان زیاتر دژایەتیان دەکردو لەداخا قەپیان بەدەستی خۆیاندا ئەکردو ئاماژەیان ئەکرد بە دەستیان بۆ پێغەمبەرەکانیان کە قسە نەکەنو هەمو نیعمەتەکانی خوایان بەتایبەتی نیعمەتی رەوانەکردنی پێغەمبەرانیان بەکەم زانیو سوپاسیان نەکردوگوتیان: ئێمە بێ باوەڕین بەوەی کە ئێوەی بۆ رەوانەکراوەو بەراستی ئێمە گومانمان هەیە لەبارەی ئەو شتەوە کە ئێوە ئێمەی بۆ بانگ ئەکەنو دوو دڵینو بەراستی نازانین.

﴿١٠﴾ پێغەمبەرەکانیان پێیان وتن: ئایا لە بارەی خواوە گومانتان هەیە کەدروستکاری ئاسمانانو زەویە؟ وە ئەو زاتە بانگتان دەکات تا لە گوناهەکانتان خۆش ببێت وزوو تۆڵەتان لێ وەرناگرێو دواتان ئەخات تاماوەیەکی دیاری کراو، جا لە جیاتی ئەوەی کە سوپاسی بکەن ئێوە کوفری دەکەن؟ ئینجا بێباوەڕان لە وەڵامی پێغەمبەرەکانیاندا وتیان: ئێوەش بێجگە لەوەی بنیامێکن وەکو ئێمە شتێکی ترنین، ئێوە ئەتانەوێ بەرگری ئێمە بکەن لە بەندایەتی ئەو خودایانەی کەباو باپیرانمان بەندایەتیان بۆ کردوە، ئێمە باوەڕتان پێ ناکەین ئەگەر راست ئەکەن ئادەی بەڵگەی ئاشکرامان بۆ بهێنن، بەڵێ بەدرێژایی مێژوی ئادەمیزاد مەگەر بەدەگمەن ئەگینا هیچ کات قسەی رەوانە کراوی خودایان بەراست نەزانیوەو هەمیشە لەگەڵ بونی دەیان بەڵگەی راستو رۆشن لەسەر راستی ئەو پێغەمبەرانە هەر بەهانەی هاتنی بەڵگەی تریان گرتوە.

﴿١١﴾ جاپێغەمبەرەکانیشیان گوتویانە بەڵێ ئێمەش بێجگە لە بنیامێکی وەکو ئێوە شتێکی ترنینو بەڵگە هێنان تەنها بەبڕیاری ﷲ یە بەڵام ﷲ منەت ئەخاتە سەر ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت لە بەندەکانی خۆیوهەڵی دەبژێریو ئەیکات بەپێغەمبەر تەنها ئەوە هەیەو ئێمەش تەنها بەوە لە ئێوە زیاترینو ناتوانین بەکەیفی خۆمان چیمان ویست ئەنجامی بدەینو ناتوانین هیچ بەڵگەیەك بهێنین بۆ ئێوە مەگەر ﷲ رێگامان پێ بدات، وە باوەڕداران با تەنها بەﷲ پشت ببستن، چونکە هەر ئەوە پشتو پەنایانو جێگای ئومێدو فێنکی دڵودەرونیان.

﴿١٢﴾ دەی ئەبێ بۆ ئێمە پشت نەبەستین بە خوای خۆمان لە حاڵێکدا کە ئێمەی رێنمای کردوە بۆ هەموریگاو ئیشە چاکەکانمان کە رێگای ئاینەکەی خۆیەتی؟ و بەراستی ئێمە خۆ ئەگرین لەسەر ئێشو ئازارێ کە ئێوە بۆمان دروست ئەکەن لەسەر ئەو ئاینەی ﷲ ، وە ئەو کەسانەی کە پاڵپشت ویارمەتی دەریان دەوێت با تەنها بەخوا پشت ببەستن چونکە تەنها خوایە

أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۚ إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ وَيَأۡتِ بِخَلۡقٖ جَدِيدٖ (١٩) وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٖ (٢٠) وَبَرَزُواْ لِلَّهِ جَمِيعٗا فَقَالَ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا مِنۡ عَذَابِ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۚ قَالُواْ لَوۡ هَدَىٰنَا ٱللَّهُ لَهَدَيۡنَٰكُمۡۖ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَجَزِعۡنَآ أَمۡ صَبَرۡنَا مَا لَنَا مِن مَّحِيصٖ (٢١) وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ إِلَّآ أَن دَعَوۡتُكُمۡ فَٱسۡتَجَبۡتُمۡ لِيۖ فَلَا تَلُومُونِي وَلُومُوٓاْ أَنفُسَكُمۖ مَّآ أَنَا۠ بِمُصۡرِخِكُمۡ وَمَآ أَنتُم بِمُصۡرِخِيَّۖ إِنِّي كَفَرۡتُ بِمَآ أَشۡرَكۡتُمُونِ مِن قَبۡلُۗ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ (٢٢) وَأُدۡخِلَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡۖ تَحِيَّتُهُمۡ فِيهَا سَلَٰمٌ (٢٣) أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا كَلِمَةٗ طَيِّبَةٗ كَشَجَرَةٖ طَيِّبَةٍ أَصۡلُهَا ثَابِتٞ وَفَرۡعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ (٢٤)

ئەتوانیٚ سود، یان زیانیان پیٚ بگەیەنیٚت، ئینجا دریٚژە بە باسی کافرانو بیٚ باوەڕان ئەداتو ئەفەرمویٚ:

(١٣) ئەوانەی کە بیٚ باوەڕبوون بە پیٚغەبەرەکانیان وت: بەراستی ئیٚمە لەم وڵاتو خاکەی خۆمان دا دەرتان دەکەینو وازتان لیٚ ناهیٚنین یان ئەبیٚ دەربچن یان ئەبیٚ بگەڕیٚنەوە بۆ سەر ئاینی ئیٚمە، جا پەروەردگاریان کە هەمیشە یاریدەدەری پیٚغەمبەران بوە وەحی کردوەتە لایانو فەرمویەتی: لەسەر ئیشی خۆتان خۆبگرنو گویٚ بە قسەی ئەوان مەدەنو مەترسن، بەراستی ئیٚمە ستەمکاران لەناو ئەبەینو سەرشۆڕیان دەکەین،

(١٤)ئەوسا پاش ئەوان ئیٚوە سەقامگیر ئەکەین لەم زەوییەداو هەمو ناخۆشیەکانتان لەبیر ئەبەینەوە، جا ﷲ ئەم رووداوەی پیٚشوو ئەکات بە بەرنامەیەکی گشتیو ئەفەرمویٚ: ئائەمە بۆ ئەو کەسەیە کە لەپایەو مەقامی منو هەڕەشەکانم ترسا بیٚتو باوەڕی بەهاتنەجیٚی قسەکانم بوبیٚت، واتە: خاوەن باوەڕ وەختیٚ ئەبیٚ چاوەڕوانی فەوتانی ستەمکاران بکاتو سەرکەوتنی خۆی کە بە دڵ باوەڕی بەقسەکانی ﷲ هەبیٚو لیٚی بترسیٚت وخۆی لە تاوانو خراپەکاری بپاریٚزیٚو هەمیشە لە خوا بپاڕیٚتەوە کە یارمەتی بدات وەکو خۆی لیٚرەدا ئەفەرمویٚ:

(١٥)پیٚغەمبەران پاش ئەوەی زانیان کە گەلەکەیان باوەڕیان پیٚ ناکەن داوای سەرکەوتنیان کرد، جا ﷲ یش داواکانی لیٚ وەرگرتن وهەمو داپڵۆسیٚنەریٚکی ملهوڕ هەر لەدنیادا رەنجەڕۆو شەرمەندە بوون.

(١٦) کە دۆزەخ لە پیٚش دەم ئەوانەو بۆ یان سازدراوە، خۆ ئاویش ئەدریٚن بە ئاویٚك کە زوخو کیٚمی دۆزەخیانە.

(١٧) بەزۆر هەوڵ ئەدات بیخواتەوە بەڵام خەریکە لەقڕوگیدا نەچیٚتە خوارەوە، ئا ئەوەیە خواردنەوەی بە لەزەتی پاشە رۆژی ستەمکاران؟! مەرگ لە هەمو لایەکەوە لە سەرەوەو لەژیٚرەوەو لەراستو لەچەپەوە بۆی دیٚت تەنانەت بەئاو خواردنەوەش بۆی دیٚت بەڵام چی بکات نە ژیانی خۆش ئەبیٚتونە ئەشمریٚت، وە لە پیٚش دەمیشیدایە سزایەکی ئەستور کە پاش ئەم هەمو ناخۆشیانە بەو سزایەش دەگات ولە ئایەتی سیوشەشی سورەتی فاتیر دا ئەفەرمویٚ: (بڕیاریان بەسەردا نادریٚت تا بمرن وە سزایشیان لەسەر سوك ناکریٚت) لەوانەیە لیٚرەدا پرساریٚك بەمیٚشکی مرۆڤدا بیٚت کە خۆ هەندیٚ لەبیٚباوەڕان ئیشی چاکە ئەکەن لە دنیادا ئایا ئەوانیش لەگەڵ کافرو بیٚباوەڕانی تردا کە چاکە ناکەن وەکو یەکن؟ ئەی چاکەکانیان چی بەسەرهات؟ ﷲ ئەفەرمویٚ:

(١٨) ویٚنەی کرداری چاکەی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە پەروەردگاری خۆیان نیە وەکو خۆڵە میٚشیٚك وایە کە بایەك لیٚی هەڵ بکات لە رۆژیٚکی بای توندداو کەس نەتوانیٚ هیچ شتیٚك لەو خۆڵە میٚشە کۆبکاتەوە، وە هەر ئاوەهاش ئەو بیٚباوەڕانە بەهۆی کوفرەکانیانەوە هەمو کردارە چاکەکانیان بەزایە ئەچیٚتو ناتوانن هیچ شتیٚك لەو کردارە چاکەیان بەدەست بهیٚننەوە، کەواتە بەراستی ئەوە سەرلیٚشیٚواویو گومڕاهیەکی زۆر دورە لەژیریو راستیەوە، منیش ئەڵیٚم: چاکەت نەماوە ... خراپەت تۆمارە، ئاوی شیرینت وەك زەهری مارە ... دەبا نۆشی کات ئەو ستەمکارە .

ئینجا پەروەدگاری زاناو داناو بەدەسەڵات، بەشیٚك لە دروستکراوە گرنگەکانی خۆی دەخاتە پیٚش چاوی ئیٚمە تا بزانین کە زیندو کردنەوەمان لای خوا زۆر لەو دروستکراوانە ئاسانترە جا دەفەرمویٚ:

(١٩)ئایا تۆ نابینیو نازانی کە ﷲ دروستکەری ئاسمانانو زەویە بۆ مەبەستیٚکی دروستو راست، ئەگەر ﷲ ئارەزۆ بکات ئیٚوە لا ئەبات وکۆمەڵیٚکی تازە دەهیٚنیٚت، واتە: ﷲ خاوەن دەسەڵاتەو هەڕەشە لە خەڵکی دەکات تا خۆیان لە تاوانو خراپە بپاریٚزن تا ﷲ لەناویان نەباتو شەرمەندەو رنجەڕۆ نەبن.

(٢٠) خۆ ئەوە شتێکی زۆر گران نییەو بارێکی قورس نییە لەلای ﷲ.

ئینجا بەرەو ڕۆژی دوایی وەك ڕوداوێکی ڕابردو سرنجمان ڕائەکێشیٚو دەفەرمویٚ:

(٢١) جا هەمو دەرکەوتنو ئاشکرا بوون لەپێشگای ﷲ داو کاتی بگرە بەردەو حیسابیان بۆ هاتە پێشەوە ئەوسا لاوازەکان بەگەورەو خۆبەزلزانەکانیان وت: بێگومان ئێمە لە دنیادا پەیڕەوو پاشکۆی ئێوە بوین ئایا ئێوە دەتوانن کە شتێك لەو سزایەی ﷲ لە کۆڵ ئێمە بکەنەوەو کەمێك باری ئێمە سوك بکەن؟ ئەوانیش ئەڵێن: ئەگەر خوا ڕێنمای ئێمەی بکردایە ئێمەش ڕێنمای ئێوەمان دەکرد بەڵکو هەردووکمان سەرلێشێواو ڕەنجەڕۆین، جا یەکسانە بۆمان چ هاوارو دادو ناڵە بکەین چ خۆ بگرین، چونکە بۆ ئێمە هیچ پەناگاهێك نییەو ڕزگار نابین. تەماشا بکەنو بزانن کە ئەم ڕوداوە هێشتا نەهاتوە وەکو وتمان بەڵام قورئان وای بەئێمە پیشان دا کە ئەوە بوەو ڕوی داوە وەکو هەواڵێکی ڕابوردو بۆی باسکردین تا بزانین کە ئەمە ئەوەندە ڕاستە وەکو ئەوە وایە کە ڕویدابێت، لەڕاستیدا هەمو شتێك لە زانیاری خوادا بەرلە دروستکردنی ئاسمانانو زەویو هەمو شتەکان بوەو پەنجا هەزار ساڵیش بەر لە دروستکردنی ئاسمانانو زەوی تۆمارکراوە، جا چونکە هەندیٚ لەفریودەرەکانی مرۆڤ شەیتانە، ئەویش ئامادە ئەکرێتو هەوڵی پاکانە کردنی خۆی ئەدات، وەك دەفەرمویٚ:

(٢٢) کاتێك حوکم جیٚ بەجیٚ کراو کافران چونە ناو دۆزەخەوەو موسڵمانان چونە ناو بەهەشت، شەیتان بە بێباوەڕان دەڵیٚ: ﷲ بەڵێنی داوە بە ئێوە بەڵێنی ڕاستو فەرموی: ئەگەر چاکە بکەنو ڕێگای ﷲ بگرنو پەیڕەوی پێغەمبەران بکەن ئەتان خەمە ناو بەهەشتەوە بەڵام ئێوە بەگوێتان نەکردو منیش بەڵێنم پێدان بەڵام ڕاستم لەگەڵدا نەکردن ومن هیچ دەسەڵاتو تواناییەکم بەسەر ئێوەدا نەبوەو هیچ بەڵگەیەکی ڕاستو دروستیشم پیٚ نەبوە کە ئێوەی پیٚ فریو بدەم، بێجگە لەوەی کەمن بانگم کردن بۆ خراپەو تاوانو ئێوەش بیٚ سیٚو دوو وەڵامتان دامەوەو بە گوێتان کردم کەواتە لۆمەی من مەکەن لۆمەی خۆتان بکەن خۆتان واتان بە خۆتان کردوە، نە من بانگی ئێوە ئەکەم نە ئێوەش بانگی من بکەن، چونکە تازە هیچکامان ناتوانین هیچ شتێك بکەین بۆ ئەوی ترمانو ئەبیٚ لەم سزایەدا بمێنینەوە، بێگومان من بێباوەڕیشم بەوەی کەمنتان لە دنیادا کردبیٚ بە هاوبەش بۆ ﷲ ، بەم شێوەیە ئەو شەیتانەی کە بە ملیاردها کەس پەیڕەوی لیٚ کردوەو لێی دەکات لەو ڕۆژەدا ئەبیٚ بە دوژمنیانو بێزارە لە ڕەفتاریان بەڵام نە شەیتانو نە پەیڕەوانی بەم قسانە ڕزگاریان نابیٚ، چونکە ستەمکارنو بێگومانیش بۆ ستەمکاران سزای پڕ مەترسیو دەردناك هەیە، جا لە پاش ئەوەی باسی خراپانی کرد باسی چاکانیش ئەکاتو ئەفەرمویٚ:

(٢٣) جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە ئەخرێنە ناو بەهەشتانێکەوە کە چەندین جۆگای ئاوو شیرو شەرابو هەنگوین لە ژێر ئەو بەهەشتانەدا ئەڕواتو بۆ هەمیشە تێیدا ئەمێنینەوە بە بڕیاری پەروەردگاری خۆیان کە چاك وچۆنی کردن لەوان لەو ڕۆژەدا سەلام کردنە، جا چ خۆیان لە نێو خۆیاندا سەلام لە یەکتر ئەکەن یان فریشتەکان سەلامیان لیٚ ئەکەن یان ﷲ سەلامیان لیٚ ئەکات واتە لەو شوێنەدا تەنها ئەمنو ئاسایشو قسەی بیٚ زیان هەیەو هیچی تر، پاش ئەم گفتو گۆیە ﷲ وێنەی قسەی باوەڕداران باس ئەکات لەگەڵ قسەی بێباوەڕانداو ئەفەرمویٚ:

(٢٤) ئایا تۆ نابینی کە خوا چۆن نمونە باس دەکات لە سەر چاکەو خراپە، چاکە وەکو ئەو وشە پاکەیە کە لە دەمی خاوەن باوەڕەوە دەر ئەچێت وەکو وشەی { لا اله الا ا } کە ئەو وشە پیرۆزە وەکو درەختێکی ساقو پاك وایە کە ڕیشەی بەزەویدا چوبێتە خوارەوە، وە پەلەکانیشی بەرەو ئاسمان کشابیٚ،

(٢٥) هەمیشە بەرهەمو میوەی خۆی بدات بە بڕیاری پەوەردگاری خۆی جا ﷲ وێنەکان باس ئەکات بۆ خەڵك بەڵکو بیر بکەنەوەو واز لە کوفرو تاوان بهێنن، ئینجا قسەی بیٚ باوەڕان باس ئەکاتو ئەفەرمویٚ:

(٢٦) ئەوسا وێنەی وشەی خراپ کە بریتیە لە شیرك ولادان لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیو دژایەتیو باوەڕ پیٚ نەکر دنیان وەکو درختێکی پیس وایە کە هەڵکێشرابیٚو لە سەر زەویدا دانرابیٚ وخۆی نەگرێت، واتە: باوەڕدار ئەو مرۆڤە بە هێزو توانایە کە ڕیشەی کوتاوە بە زەویداو هەرگیز هەڵناکەنرێتو کردارە جوانەکانی بەرەو پێشگای ﷲ سەر ئەکەوێتو هەمو ساتو کاتیٚ خێرو فەڕە بۆ خۆیو بۆ گەلو وڵاتی بەڵام بێباوەڕان وەك درختێکی هەڵکێشراو وان نەك هیچ سودیان بۆ خەڵك نییە بەڵکو خۆیشیان پیٚ ڕاگیر ناکریٚ نە زەوی ڕازیە لەودا شین ببیٚو نە کرداری چاکی هەیە تاسەرکەویٚ بۆ ئاسمان بەڵکو خواو فریشتەکانو هەمو دروستکراوەکانی نەفرینی لیٚ ئەکەن وەکو لە سورەتی (بەقەرە) دا باسکراوە. ئەمە وێنەی دیمەنی دنیای چاکانو خراپانە.

ئینجا ﷲ باسی کاتی هاتنی دوا ڕۆژیان ئەکاتو ئەفەرمویٚ:

تُؤۡتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينِۭ بِإِذۡنِ رَبِّهَاۗ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٥﴾ وَمَثَلُ كَلِمَةٍ خَبِيثَةٖ كَشَجَرَةٍ خَبِيثَةٍ ٱجۡتُثَّتۡ مِن فَوۡقِ ٱلۡأَرۡضِ مَا لَهَا مِن قَرَارٖ ﴿٢٦﴾ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡقَوۡلِ ٱلثَّابِتِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّٰلِمِينَۚ وَيَفۡعَلُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ ﴿٢٧﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ بَدَّلُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ كُفۡرٗا وَأَحَلُّواْ قَوۡمَهُمۡ دَارَ ٱلۡبَوَارِ ﴿٢٨﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴿٢٩﴾ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلُّواْ عَن سَبِيلِهِۦۗ قُلۡ تَمَتَّعُواْ فَإِنَّ مَصِيرَكُمۡ إِلَى ٱلنَّارِ ﴿٣٠﴾ قُل لِّعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خِلَٰلٌ ﴿٣١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجَ بِهِۦ مِنَ ٱلثَّمَرَٰتِ رِزۡقٗا لَّكُمۡۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ لِتَجۡرِيَ فِي ٱلۡبَحۡرِ بِأَمۡرِهِۦۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلۡأَنۡهَٰرَ ﴿٣٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ دَآئِبَيۡنِۖ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ ﴿٣٣﴾

(٢٧) الله ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوە لە دنیادا لە كاتی وەڵام دانەوەی فریشتەكاندا زمانیان پاراوو بەهێز ئەكات بۆ وەڵام دانەوەیان بە هۆی ئەو وشە جوانەوە كە (لااله الا ا مد رسول ا )یەو باوەڕیان پێی بووە لە ژیانی دنیادا، وە لە ڕۆژی دوایشدا ئەو وشە جوانە ئەبێ بە هۆی ڕزگاربونیان هەم لە كێشەی گۆڕو هەم لە سەر پردی سیرات، ئەوسا الله ستەمكاران لەهەردوو ژیاندا گومڕاو سەرلێشێواو ئەكاتو الله ئارەزۆی لە هەر شتێك ببێت دەیكاتو كەس ناتوانێت ڕێگای لێ بگرێت. بەڕائی كوڕی عازیب دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: { إذا أُقعِدَ ا ؤمنُ ق ِه؛ أ ، ّ شهدَ أن لا إله إلا ا ُ، وأنّ ّمداً رسولُ ا ِ، فذلك قولُه: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... الآية﴾ /متفق عليه/ هەركاتێ باوەڕدار لەناو گۆڕەكەیدا دانراو كەسێك هاتە لای، لەپاشان شایەتی دا كەجگە لە الله هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینەی ترنیەو محمد ﷺ پێغەمبەری الله یە ئەوە كاتی فەرمودەكەیەتی: ﴿ يُثَبِّتُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... الآية﴾ } بەڕاستی الله خاوەنی ئاسمانانو زەویو ئەوەی كە لە ناویدایەو هەرچی بكات لە موڵكی خۆیدا ئەیكاتو كەس بۆی نیە دەست بخاتە كارو باریەوە،

ئینجا الله باسی بێباوەڕان بەشێوەیەكی تر ئەكات، كەئەبنە مایەی شەڕو نەگبەتی بۆ خۆیشیانو بۆ خەڵكیش هەرچەند لە دنیادا تا گرفتار ئەبن بەقسەی زلو لافی بێ جێ خۆیان بەدڵسۆزو خەمخۆرو مرۆڤدۆست حیساب ئەكەنو خوداو پێغەمبەرﷺو پەیرەوانیان بە نەفام وبێ ڕەحمو دژی گەلو وڵات باس دەكەن .

(٢٨) ئایا تۆ نابینیت ئەو كەسانەی كە نیعمەتی الله كە بریتیە لە وەرگرتنو پەیڕەوی كردنی ئایینی ئیسلام وەلایان ناو گۆڕییان بە كوفرو فەساد، ئینجا بەهۆی ئەو كوفرو فەسادەی ئەوانەوە الله عاجز بو لێیانو لە ناوی بردن ئا بەو شێوەیە گەلەكەی خۆیان خستە ئەو بەدبەختی ورۆژ ڕەشیەوە.

(٢٩) خۆجێگایان دۆزەخەو ئەچنە ناویەوەو پیسترین جێگاو قەرارگایە ئەو دۆزەخە بۆیان، ئەوە سەر ئەنجامی ستەمكارانو بێباوەڕانو پەیڕەوو ژێر دەستەكانیانە، ئەگەر خەیر خوایەك لەم دنیادا ئاموژگاریان بكات بەدژی ئازادی دایدەنێنو هیچ حیسابێك ناكەن بۆماڤ ئەوگەلەی كەبەهۆی ئەوانەوە دوچاری ئەو هەمو بەدبەختیە دەبێت، شاعیر چاكی وتوە:

تاكەی بیرناكەی ئەی مرۆی بەدكار...بۆ خۆتو گەلت بویتە سەگی هار... سەروەتی وڵات گشت بخەگیرفان... ڕزگارت ناكا لەتۆڵەی یەزدان...خودا دادگەرەو دژی ستەمكار... وات بەسەردێنێ خۆزگە خۆی لەپار.

(٣٠) جا بۆ خوا شەریكانێك دا دەنێن تا خۆیانو خەڵكیش گومڕابكەنو لە ڕێگای الله لایان بدەنو بەو شێوەیە دوچاری سزای دنیاو دوارۆژیان بكەن، خواش بە پێغەمبەرﷺ ئەفەرموێ: پێیان بڵێ ڕابوێرن لە دنیاداو بێ منەت بن چی دەكەن بیكەن لە خراپەوتاوان بەڕاستی عاقیبەتتان چونە ناو ئاگری دۆزەخە، جائەمە هەڕەشەیە نەك ماوەدان بەو تاوانبارانە،

(٣١) ئەی محمدﷺ بڵێ: بەو بەندانەم كە باوەڕیان هێناوە نوێژەكانیان بەرێكو پێكی بكەنو لەوەی كە ئێمە پێمان داوون ببەخشن بەپەنامەكیو بەئاشكرا پێش ئەوەی ڕۆژێك بێتە پێشەوە كە هیچ مامەڵەكردنێكی تێدا نیە تا كابرا بتوانێ خۆی بكڕێتەوە وهیچ دۆستایەتیەكیش نیە كە بتوانێ پاڵپشتی یەكتری بن بەڵكو دۆستەكانی دنیایی لەو ڕۆژەدا هەمویان دوژمنی یەكترن، وەك لە سورەتی (زوخروف)دا یە، بەڵێ ئەو كەسانەی كە ئەو دوو وەسفە گرنگەیان تێدا بێت بەو شێوەی كە الله فەرمانی پێداون ئەوانە چاكەكارانو لە ڕۆژی دوایشدا پاش ماوەدانی الله دۆستو پاڵپشتی یەكتری ئەكەن. جارێكی تر پەروەردگارمان هەندێك لە نیعمەتەكانی خۆی ئەخاتەوە بەر چاوانو ئەفەرموێ:

(٣٢) الله ئەو زاتەیە کە ئاسمانانو زەوی دروستکردوە ولە ئاسمانەوە ئاو ئەنێرێتە خوارەوە جا بەو ئاوە لەدرەختەکان میوەو بەرووبووم دەر ئەهێنێت تا ببێتە مایەی بژیوی بۆئێوەو کەشتی گەردنکەچورام کردوەو هێزێکی وای بەئاوداوە کە ئەو کەشتیە گەورە هەلگرێ تا لە دەریاکان بە کەیفی خۆتان هاتوچۆ بکەن لەبەر ئەوفرمانەی کە خوێ بەدەریاکانی داوە، وە روبارو جۆگاکانی گەردنکەچ کردوە بۆتانو بۆ هەر لایەك ئەتانەوێ ئەو ئاوە ئەبەن بەناو ئەو زەوییەدا. بەراستی ئەگەر ژیرانە بیر بکەینەوە گەورەیو سۆزی پەروەردگارمان بۆ دەرئەکەوێت، ئەو هەمو ئاسنە بەسەر ئەو ئاوەشلەوە کێ راگیری ئەکات؟ کامەیە ئەو هێزە بۆ بەچاو نایبینین هەر پارچەیەك لەو ئاوە بەکەیفی خۆت ئەم دیو دیوی بکە هیچ رەقیەکی تێدا نابینی ئەی چی ئەو کەشتیە گەورانە راگیر ئەکات؟ وە بە هەزاران روباری لەسەر ئەم زەوییەدا دروستکردوە تا بەئاسانی ئاوی دارو درختو شیانابیەکانتانی پێ بدەن،جا ئەی مرۆڤ تاکەی واکەوڕوکاسی، بەسیەگومڕاهی رووکە خواناسی،

(٣٣) خۆ رۆژو مانگیشی گەردنکەچو رام کردوە بۆتان کە بە هەمیشەیی ئەم هاتوچۆیە دەکەن بۆ جوان دابین کردنی ژیانتان، وە شەوو رۆژیشی گەردنکەچ کردوە بۆتان.

(٣٤) جا هەر شتێك کە ئێوە پێویستان پێی هەبێتو داوای بکەن یان داوا نەکەن الله لەو زەویەدا پێی داوون ، خۆئەگەر نیعمەتەکانی الله بژمێرن ئەوەندە زۆرە هەرگیز ناتوانن بیانژمێرن بەڵام بێگومان کە مرۆڤ بەهۆی سپڵەییو کوفرانی نیعمەتەکانی الله وە، زۆر ستەم لەخۆی دەکات چونکە بێ منەتە لەو هەمو نیعمەتانەی کە الله پێی بەخشیوە.

ئینجا دێتە سەر باسی ئیراهیم سەلامی خوای لەسەربێو پاڕانەوەکەی کاتێ کە کەعبەی پیرۆزی تەواوکردو دەفەرموێ:

(٣٥) ئەی محمدﷺوەبیریان بهێنەرەوەو باسی ئەو کاتە بکە کە ئیبراهیم وتی: ئەی پەروەردگارم ئەم شارە بکە بەشارێکی پڕ ئەمنو ئاسایش بۆ دانیشتوانی وخۆمو کوڕەکانم دوور بخەرەوە لەوەی کە ئەم بتانە بپەرستین .

(٣٦)پەروەردگارم بەراستی ئائەم بتانە زۆرێك لە خەڵکیان گومراکردوە، جا ئەو کەسەی کە پەیڕەوی لەمن بکات لە منە، وەئەو کەسەی کە فەرمانی منی شکاند بەراستی تۆ چاو پۆشی کارو بەرەحمیت، جا تەماشای دۆستانی خوا بکەن لێرە نەیفەرمو

وَءَاتَىٰكُم مِّن كُلِّ مَا سَأَلْتُمُوهُۚ وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحْصُوهَآۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ ﴿٣٤﴾ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ رَبِّ ٱجْعَلْ هَٰذَا ٱلْبَلَدَ ءَامِنًا وَٱجْنُبْنِى وَبَنِىَّ أَن نَّعْبُدَ ٱلْأَصْنَامَ ﴿٣٥﴾ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضْلَلْنَ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِۖ فَمَن تَبِعَنِى فَإِنَّهُۥ مِنِّىۖ وَمَنْ عَصَانِى فَإِنَّكَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٦﴾ رَّبَّنَآ إِنِّىٓ أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِى بِوَادٍ غَيْرِ ذِى زَرْعٍ عِندَ بَيْتِكَ ٱلْمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجْعَلْ أَفْـِٔدَةً مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهْوِىٓ إِلَيْهِمْ وَٱرْزُقْهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَشْكُرُونَ ﴿٣٧﴾ رَبَّنَآ إِنَّكَ تَعْلَمُ مَا نُخْفِى وَمَا نُعْلِنُۗ وَمَا يَخْفَىٰ عَلَى ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِى ٱلسَّمَآءِ ﴿٣٨﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى وَهَبَ لِى عَلَى ٱلْكِبَرِ إِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَۚ إِنَّ رَبِّى لَسَمِيعُ ٱلدُّعَآءِ ﴿٣٩﴾ رَبِّ ٱجْعَلْنِى مُقِيمَ ٱلصَّلَوٰةِ وَمِن ذُرِّيَّتِىۚ رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَآءِ ﴿٤٠﴾ رَبَّنَا ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ ٱلْحِسَابُ ﴿٤١﴾ وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّٰلِمُونَۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٤٢﴾

هەر کەسێ بەگوێ منی نەکرد سزای بدە بەڵکو فەرموی تۆ چاو پۆشیکارو بەرەحمیت. ئینجا وتی:

(٣٧) ئەی پەوەردگارم بێگومان من بەشێك لە منداڵو خێزانی خۆم کە ئیسماعیلو دایکێتی لە شیوێکی بێ کشتوکاڵدا کە هیچ شینابیەکی تێدا نییە لە لای ماڵە قەدەغە کراوەکەی تۆدا جێگیرم کردوە داوا لە میهرەبانیت ئەکەم کە فەڕوو بەرەکەتی خۆت بەسەر ئەو ناوچەدا بڕێژیت، نەك بۆ رابواردن بەڵکو بۆ ئەوەی نوێژەکانیان بەرپێك وپێکی ئەنجام بدەن، ساتۆ وابکە کە دڵی هەندێك لە خەڵك راکێشە بۆ لایانو پێ بژیویان بو دابین بفەرموە ولەبەرو بوومەکانی ئەوانیان بۆ رەوانە بکە تائەوان سودی لێ وەرگرنو زیاتر بەندایەتیت بکەنو چاکتر لە تۆ بترسن بەڵکو ئەوانیش شوکروسوپاسی تۆبکەن.

(٣٨) ئەی پەروەردگارمان بەراستی ئەوەی کە ئێمە ئاشکرای ئەکەینو ئەوەیشی کە ئەیشارینەوە تۆ ئاگات لێی هەیە، ئاگات لە نیەتی من هەیەو مەبەستم ئەزانیتو هیچ شتێك لە الله پەنهان ناکرێتو ناشارێتەوە نە لە زەویو نەلە ئاسماندا، ئەگونجێ ئەمە فەرمودەی الله بێت. ئینجا ئیبراهیم سوپاسی خوا ئەکات کەلەم تەمەنە پیریەیدا الله منداڵی پێ بەخشیوە ئەڵێ:

(٣٩) سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لەم تەمەنە گەورەو سەردەمە پیریەمدا ئیسماعیل وئیسحاقی پێ بەخشیم بەراستی

مُهۡطِعِينَ مُقۡنِعِي رُءُوسِهِمۡ لَا يَرۡتَدُّ إِلَيۡهِمۡ طَرۡفُهُمۡۖ وَأَفۡـِٔدَتُهُمۡ هَوَآءٞ ﴿٤٣﴾ وَأَنذِرِ ٱلنَّاسَ يَوۡمَ يَأۡتِيهِمُ ٱلۡعَذَابُ فَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ رَبَّنَآ أَخِّرۡنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖ نُّجِبۡ دَعۡوَتَكَ وَنَتَّبِعِ ٱلرُّسُلَۗ أَوَلَمۡ تَكُونُوٓاْ أَقۡسَمۡتُم مِّن قَبۡلُ مَا لَكُم مِّن زَوَالٖ ﴿٤٤﴾ وَسَكَنتُمۡ فِي مَسَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَتَبَيَّنَ لَكُمۡ كَيۡفَ فَعَلۡنَا بِهِمۡ وَضَرَبۡنَا لَكُمُ ٱلۡأَمۡثَالَ ﴿٤٥﴾ وَقَدۡ مَكَرُواْ مَكۡرَهُمۡ وَعِندَ ٱللَّهِ مَكۡرُهُمۡ وَإِن كَانَ مَكۡرُهُمۡ لِتَزُولَ مِنۡهُ ٱلۡجِبَالُ ﴿٤٦﴾ فَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱللَّهَ مُخۡلِفَ وَعۡدِهِۦ رُسُلَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ﴿٤٨﴾ وَتَرَى ٱلۡمُجۡرِمِينَ يَوۡمَئِذٖ مُّقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ﴿٤٩﴾ سَرَابِيلُهُم مِّن قَطِرَانٖ وَتَغۡشَىٰ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ ﴿٥٠﴾ لِيَجۡزِيَ ٱللَّهُ كُلَّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿٥١﴾ هَٰذَا بَلَٰغٞ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُواْ بِهِۦ وَلِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ وَلِيَذَّكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٢﴾

پەروەردگارم دوعای قبوڵ کردمو داوای هەمو داواکارێك وەرئەگرێت.

﴿٤٠﴾ئەی پەوەردگارم من وا لێ بکەیت کە بەرێکو پێکی نوێژەکانم ئەنجام بدەم، وەئەی پەروەردگارمان لە نەوەکانیشم کەسانێك هەبن کە بەرێکو پێکی بەندایەتیت بۆ ئەنجام بدەنو دوعاو نزاکانمان لێوەربگرە .

﴿٤١﴾ ئەی پەروەردگارمان خۆشببە لەمنو لەباوکو دایکمو هەموو باوەڕدارانو چاوپۆشیمان لێ بکە ئا لەو رۆژەدا کەکاتی حیسابو لێکۆڵینەوەیە. دوعا بۆ باوکی پێش ئەوە بوە کە خوا بەرگری لێ کردوە وەك لە سورەتی (تەوبە)دا باسکرا، ئەگونجێ خوا لە دایکی خۆش بوبێت چونکە خوا بەرگری نەکردوە لەدوعای دایکی، باوەڕدارانی راستەقینە ئەبێ وەکو ئیبراهیم ﷺ وابن ئەو هەمو زەحمەتەی کێشاوە لە رێگای خوادا کەچی زیاتر خۆی بەبێ دەسەڵات پیشان ئەدات سەبارەت بە پەروەردگارو ئەپارێتەوە لێی کە ئەو بەندایەتیەی لێوەرگرێت، نەك وەکو بە ناو موسڵمانی ئەمرۆ بەدوو رکات نوێژی ناتەواو ﷲ بە قەرزاری خۆی ئەزانێو وائەزانێ ئەگەر ئەو بەندایەتی ﷲ نەکات ئیتر ﷲ پەکی ئەکەوێت؟! پاشان ﷲ هەڕەشە لە ستەمکاران ئەکات کە با دڵخۆش نەبن کە ﷲ ماوەیان پێ ئەدات وزوو تۆڵەیان لێ وەرناگرێت، جا دڵنەوای ستەم لێ کراوانیش ئەکاتو ئەفەرموێ:

﴿٤٢﴾ جا گومان نەبەیت کە ﷲ بێ ئاگایە لەو هەمو تاوانو خراپانەی کە ستەمکاران ئەیکەنو دڵ تەنگو نا ئومێد مەبە چونکە ﷲ هەر بۆ رۆژێك دوایان ئەخات کە لە ترسا چاوەکان تێیدا هەوڵەق دەبنو توانای چاونوقاندنیان نابێ.

﴿٤٣﴾ لە حاڵێکدا کە بەپەلە سەریان هەڵبڕیوەو چاوەڕوانی داباریني سزای (ﷲ)ـنو لە ترسا ناتوانن تەماشای خۆیان بکەنو چاویان بۆ لای خۆیان ناگەڕێتەوەو دڵیان لەو کاتەدا بۆشەو هیچی تێدا نییە بێجگە لە ترسو دڵە ترپەو بێ ئاگابوون لە خۆ، ئینجا ﷲ روئەکاتە پێغەمبەرﷺو ئەفەرموێ:

﴿٤٤﴾ئەی محمد خەڵکی بترسێنە لەو رۆژەی کە سزایان بۆدێتو هیچ پەنایەکیان نییە، جا ئەو کاتە زاڵمان ئەڵێن: ئەی پەروەردگارمان دوامان بخە بۆ ماوەیەکی نزیك، واتە بمانخەرەوە سەر دنیا وەڵامی بانگە وازەکەی تۆ دەدەینەوەوشوێن پێغەمبەرەکانت دەکەوین.

ئینجا خوا دەم کوتیان ئەکاتو ئەفەرموێ: مەگەر ئێوە نەبوون لە دنیادا سوێنتان دەخواردو دڵی یەکترتان دەدایەوەو بە یەکتریتان دەوت: کە ئێوە هەرگیز نافەوتێنو لەناوناچنو حیسابو کتابێك لە ئارادا نیەو گوێ مەدەنە قسەی پێغەمبەران؟

﴿٤٥﴾ لەحاڵێکدا کە ئێوەمان لە جێگای ئەو کەسانەدا کە ستەمیان کردبو لەخۆیان نیشتەجێ کردبو، وە چاك لەلای ئێوە رۆشن بو کە ئێمە لە تۆڵەی ستەمو دژایەتی پێغەمبەرکانیاندا چیمان بەسەر ئەواندا هێنابو، وە چەندین نمونەمان بۆ ئێوە باسکردبو، کەچی ئێوە لەو هەمو شتانە کەڵکتان وەرنەگرتو ژێر نەبون جائێستا کە فەرمانی نەمانو سزاتان بۆهاتوە داوای گەڕانەوە دەکەن؟!

﴿٤٦﴾ بەراستی ئەی محمدﷺئەوان فرو فێڵیان کرد بەو فروفێڵ کردنەیان دژی تۆو لەلای ﷲ یە فرو فێڵەکانیانوبەبێ فەرمانی ئەو هیچ زیانێکی نابێتو ئەو پێی دەزانێت وتۆڵەیان لێ ئەسێنێ جاتۆ دڵ تەنگ مەبەوخۆت بگرەو پەیامی خۆت رابگەیەنەو باکت نەبێت ئەگەر چی فرو فێڵی ئەوان زۆر توندبو بەڵام ناتوانێت چیاکان کەئیسلامو پەیرەوانیەتی لە ناوببات، واتە: ئەوان هەر لە سەرەتای هاتنی ئیسلامەوە بۆ ئەوەی پێغەمبەرو موسڵمانان لەبەین ببەن ئەو هەمو فروفێڵەیان کرد ئەوەبو لەسەردەمی کۆچکردنی یارەکانی پێغەمبەرﷺدا بۆ (مەدینە)

تەنانەت قورەیشەکان ویستیان کە پێغەمبەرﷺبکوژن‌و دە کەسی کوڕی گەنجیان بۆ ئەو مەبەستە دانا بەڵام ﷲ پێغەمبەروﷺیارە بەڕێزەکەی (**ابوبكرالصديق**ﷺ) رزگار کردو فرو فێڵەکەی ئەوانی پوچەڵ کردەوە، جارێکی تر خوای زاناو دانا دڵنەوایی پێغەمبەرمان ﷺئەکات‌و دەفەرموێ:

(٤٧) ئەی محمدﷺوە ئەی ئەوانەی کە بەراستی لە گەڵ قورئان دان‌و دەیخوێننەوە گومان نەکەن کە ﷲ پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی خۆی کە داوێتی بە پێغەمبەرەکانی بکات بێگومان کە ﷲ زۆر بەهێزەو لە تاوانباران‌و بێ باوەڕان تۆڵەسێنە، جا نائومێد مەبەو دڵنیابە کە تاوانبار هەرگیز لەدەست تۆڵەی ﷲ رزگاری نابێ بەڵام ژیانی دنیا زۆر کەمەو جێگای وەرگرتنی هەموو تۆڵەکان نیە،

(٤٨) بەڵکو جێگای تۆڵە ئەو رۆژەیە کەئەم زەوییە ئەگۆڕێت بە زەوییەکی ترو ئاسمانەکانیش دەپێچرێنەوەو هەموویان ئامادەو ئاشکرائەبن لە بەردەم ﷲ ی تەنهاو بەتواناداا. وەئەفەرموێ: کێ خاوەنی موڵکە؟ کەس توانای وەڵام دانەوەی نیەو خۆی ئەفەرموێ: مالیکی ئەمڕۆ تەنها خوای تاک‌و بە توانایە، لەپێغەمبەری خواﷺپرسیار کرا کەکاتێ ئەم زەوییە ئەگۆڕێ بەزەوییەکی تر خەڵك لەکوێدا دەبن؟ فەرموی:{ هُمْ عَلَى الصِرَاطِ/مسلم/ ئەوان لەسەر پردی سیرات دا دەبن}

جا ئالەم رۆژەدایە کە ستەمکاران قەپ ئەکەن بەدەست خۆیانداو پەشیمانن لەوەی کە کردویانە بەڵام تازە پەشیمان بونەوە سودێکیان پێنادات‌و ئەبێ لێکۆڵینەوەی هەمو تاوانەکانیان لەگەڵ دا بکرێت‌و لە پاشدا کۆت‌و زەنجیر بکرێن‌و بەرەو دۆزەخ بەرێ بکرێن وەکو لێرەدا نمونەیەکی ئەو کۆت‌و زنجیرەمان بۆ باس ئەکات‌و ئەفەرموێ:

(٤٩) ئەی محمدﷺوەئەی بینەر تۆ ئەبینی تاوانباران لەو رۆژەدا هەموویان سەرو ملیان بەیەکەوە بەستراوەو زنجیرکراون‌و هەمو هاو وێنەکان بەیەکەوە بەسراوون.

(٥٠) لیباسەکانیان بریتیە لە مسی تواوەو داغ کراوی ناو ئاگری دۆزەخ‌و رەشە ودەم وچاویان ئاگر دای پۆشیوە. ئائەمە بەشێکە لە سزای ئەو موجرم تاوانبارانەی کە لە دونیادا گاڵتە بەپێغەمبەران دەکەن.

(٥١) تا خوا پاداشتی هەمو کەسێك بداتەوە لە سەر ئەو ئیشانەی کە لە دنیادا کردویانە بێگومان کە ﷲ زۆر بەپەلەیە لە لێکۆڵینەوەوبڕیاردا، چونکە خۆی هەمو شت ئەزانێ‌و هەمو

١٥ سُورَةُ الحِجْرِ ٩٩

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرۡهُمۡ يَأۡكُلُواْ وَيَتَمَتَّعُواْ وَيُلۡهِهِمُ ٱلۡأَمَلُۖ فَسَوۡفَ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٞ مَّعۡلُومٞ ﴿٤﴾ مَّا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ ﴿٥﴾ وَقَالُواْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلذِّكۡرُ إِنَّكَ لَمَجۡنُونٞ ﴿٦﴾ لَّوۡ مَا تَأۡتِينَا بِٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَمَا كَانُوٓاْ إِذٗا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا ٱلذِّكۡرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي شِيَعِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسۡلُكُهُۥ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَقَدۡ خَلَتۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوۡ فَتَحۡنَا عَلَيۡهِم بَابٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعۡرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓاْ إِنَّمَا سُكِّرَتۡ أَبۡصَٰرُنَا بَلۡ نَحۡنُ قَوۡمٞ مَّسۡحُورُونَ ﴿١٥﴾

کەسێکیش خۆی ئەزانێت کەچی کردوە چونکە پێشتر نامەی کرداری خۆی پێدراوە، ئینجا کۆتایی سورەتەکە دەبەسێتەوە بەسەرەتاکەیەوە کەباسی قورئانەوەودەفەرموێ:

(٥٢) ئا ئەم قورئانە راگەیەنراوێکە بۆ خەڵك تا باش بیر لە رابوردوان بکەنەوەو بزانن گەلانی پێش خۆیان چۆن جوڵانەوەو چییان بەسەرهات تابەم شێوەیە بترسێنرێن بەم قورئانەو بزانن هیچ پەرستراوێکی راستەقینە بێجگە لە ئەو زاتە کە پەرستراوێکی تەنهایە نیەو تا خاوەن عەقڵەکان بیر بکەنەوەو سودی تەواو لەم قورئانە وەربگرن.

## ١٥ سورەتی حیجر ٩٩

سورەتی حیجر کە سورەتی پانزەهەمی قورئانە، سورەتێکی مەکیە، نەوەدو نۆ ئایەتەو، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاوچوارەمەو پاش سورەتی (**یوسف**)و پێش (**الأنعام**) دابەزیوە. لە ئایەتەکانی کۆتای سورەتی پێشو کە سورەتی ئیبراهیمە سەلامی خوای لێبێت باس لە حاڵ‌و بارودۆخی بێ باوەڕان کرا لە ناو ئاگری دۆزەخدا، جا لە سەرەتای ئەم سورەتەدا باس لەوە دەکات کە ئەو بێ باوەڕانە کە لەو حاڵ‌و وەزعەدان کاتێك دەبینن کە باوەڕدارە تاوانبارەکان پاش چەشتنی سزای تاوانەکانیان دەچنە ناو بەهەشت، ئاوات دەخوازن کە ئەی کاش ئیمانیان بهێنایا، ئەم سورەتە زۆرتر لەبارەی سێ شتی سەرەکی

بیرو باوەڕەوە ئەدویٚ: پەروەردگارو پێغەمبەرانو ڕۆژی دوای، لەم سورەتەدا باسکراوە لە گەلی "سەمود" کە گەلی پێغەمبەر صالح بون ئەم گەلە لە "حیجر"دا کە شوێنێکە لە نێوان مەدینەو شامدا ژیانیان دەبردە سەر پاشان توشی سزای پەروەردگار بون، جا بۆیە ئەم سورەتەش بە سورەتی ﴿ا جر﴾ ناسراوە. وشەی ﴿ رُّبَمَا ﴾ لە قورئاندا تەنها لەم سورەتەدا هاتوە جا بۆیە ئەم سورەتە بە سورەتی ﴿ رُّبَمَا ﴾ یش ناو براوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بە سۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف، لام، را، ئەوەی کە بۆ تۆ خوێندرایەوەو باسکرا چەند ئایەتێکە لەم پەڕاوە بەنرخە ولەم خوێنراوە ڕۆشنکەرەوەی هەمو حەقو ناحەقێك.

(٢) هیچ دور نییە ئەوانەی کەکافرن ئاواتە خواز بنو ڕۆژێ بێ کە بڵێن: ئای خۆزگە ئێمە موسڵمان بوینایە، واتە: کاتێ کەقیامەت هات، یان کاتێك کە باوەڕداران لە سزای دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت هەمو کافرو بێ باوەڕان ئاواتی موسڵمانیەتی دەخوازن، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إذَا اجتَمَعَ أهلُ النار النار وَمَعَهُم مَن شَاءَ ا ُ مِن أهل القِبلَةِ يَقُولُ الكُفارُ ألَمْ تَكُونُوا مُسْلِمِ َ؟ قَالُوا بَلى، قَالُوا فَمَا أغْنى عَنْكُمْ إسْلَامُكُم وَقَد صِرْتُمْ مَعَنا فِي النار قَالُوا كَانَتْ لَنا ذُنوبٌ فَأُخِذْنا بِهَا فَيَسْمَعُ مَا قَالُوا فَأَمَرَ بِمَنْ كَانَ مِنْ أهل القِبْلَةِ فَأُخْرِجُوا فَلَما رَأى ذَلِكَ أهلُ النار قَالُوا يَا لَيْتَنا كُنا مُسْلِمِ َ فَنُخْرجُ كَمَا خَرَجُوا قَالَ وَقَرأ رَسُولُ ا ِ ﷺ ﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ..ا قوله.. لَوۡ كَانُواْ مُسۡلِمِينَ (٢) ﴾ /الط ا ، صححه الالبا / واتە: کاتێك کە هەمو دۆزەخییان لەناو ئاگری دۆزەخ دا کۆ دەبنەوەو لەگەڵ ئەوانیش دا هەندێك موسڵمانی تاوانبار هەیە کە اللّٰه ویستی لە سەر بوە کە بیبانخاتە ناو دۆزەخەوە، جا بێباوەڕان بەو موسڵمانانەی کە ئیستا لەگەڵ ئەواندان لە دۆزەخ دا دەڵێن: ئایا ئێوە باوەڕدار نەبوون؟ دەڵێن: بەڵێ وایە باوەڕدار بوین، جا بێباوەڕانیش پێیان دەڵێن: جا ئیسلامەکەی ئێوە چ سودێکی پێگەیاندن لەحاڵێکدا کە ئێوەش لە گەڵ ئێمە دان لەناو ئاگردا؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە خۆمان تاوانمان هەبو جا بەو هۆیەوە تۆڵەمان لێوەرگیرا ئینجا پەروەردگار ئەو وتو وێژە دەبیسێت، جا فەرمان دەدات ئەوەی کە باوەڕدارەو ئەهلی قیبلەیە لەناو ئاگر دەر بهێنرێن ئەوسا ئەوان دەردەهێنرێن، جا ئەو کاتە کە دۆزەخیان ئەمە دەبینن دەڵێن: ئای خۆزگە ئێمەش موسڵمان بوینایە، پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتانەی سەرەتای سورەتی حیجری خوێندنەوە}

بەڵێ جا ئەوان ئا لەو کاتەدا پەشیمان دەبنەوە،

(٣) جا وازیان لێ بهێنە با بخۆنوبا ڕابوێرن با ئاوات وئارەزۆکانیان مەشغوڵیان بکات لەرێگای ڕاستوبەندایەتی اللّٰه لەمەولا دەزانن چیان بەسەردێتودوچار چ سزایەك دەبن، ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە بۆ کافرانو خوانەناسان، ئەبێ بزانن کە نازو نیعمەتو پلەو پایەی دنیایی هیچ نرخێکی نیە لەلای اللّٰه بەڵکو اللّٰه بێباوەڕان بە نازو نیعمەتو پلەو پایەوە خەریك ئەکات تا ئەو کاتەی کەکاتی دیاری کراوی خۆیان دێ، جا مرۆڤی ژیرو دانا ئەبێ لەم ماوە پێدانەی پەوەردگاری سود وەرگرێتو تێشوی دوا ڕۆژی خۆی ئامادە بکات، جا ئەگەر تاوان باران بەزووی لەناوانابرێن لەبەر ڕێزو دەسەڵاتیان نیە بەڵکو لەبەر نەهاتنی کاتی دیاری خۆیانە، وەك اللّٰه ئەفەرموێ:

(٤) خۆ ئێمە هیچ وڵاتێکمان لەسەر تاوانباریو ستەم لە ناونەبردوە مەگەر ئەو کاتە دیاری کراوەی کە بۆی دانراوە هاتبێ، واتە: بۆ کاتی نەمانی هەر گەلو پێرو تاقمێك کاتێکی دیاری کراو هەیە بەهیچ شتێك لەناو ناچێت تا ئەوکاتە تەواو نەبێ، وەکو لێرەدا دوبارە ڕۆشن تر ئەفەرموێ:

(٥) هیچ گەلێك ناتوانێت ماوەو ئەجەلی خۆی پێش بخات وەناشتوانێت دوای بخات واتە: کاتی دیاری کراو بە هیچ کەس پاشو پێش ناکرێت:

(٦) خۆ بێباوەڕان بە گاڵتە پێ کردنەوە وتیان: ئەی ئەو کەسەی کە قورئانت بۆ هاتوە بێگومان تۆ شێتیت، چونکە ئەوان ئەو قورئانەیان بەراست دانەئەنا ئەوەتە ئەڵێن: ئەگەر تۆشیت نیت،

(٧) دەبا تۆ فریشتانێکت لەگەڵ خۆتدا بهێنایە بۆ لای ئێمە ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت، واتە: درۆ ئەکەیتو باوەڕت پێ ناکەین چونکە فریشتەت لەگەڵدا نیە، جا اللّٰه دەمکوتیان ئەکات وئەفەرموێ:

(٨) ئێمە فریشتەکان نانێرین بۆ سەر زەوی مەگەر بۆ مەبەستێکی ڕاست وەکو ناردنی پەیام یان سزادانی گەلان، جا ئەگەر بۆ ئەو مەبەستە ڕاستەیش ناردمانو بڕیاری سزاو لە ناوچونیانماندا ئیتر تازە بەو گەلە ماوەی گەڕانەوەو تەوبە کردنیان پێ نادرێتو لە ناو ئەبرێن، ئینجا اللّٰه بەرپەرچی ئەو بێباوەڕانەی کە ئەم قورئانەیان بەلاوە کەم زیاد تێدا کراوە ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

(٩) بێگومان ئێمە ئەو قورئانەمان ڕەوانە کردوەو چاودێریشی ئەکەین لەهەمو کەمو کوریوگۆڕانێك. بەڵێ بەڕاستی بەڵێنی خوا ڕاستەو لەگەڵ ئەو دوژمنە سەرسەختانەی ئیسلامو قورئاندا نەیانتوانیوەو ناشتوانن هیچ زیادەو کەمییەك لەو قورئانەدا

بکەن و هەرکەسێکیش پێی وابێ کە کەم و زیادی تێداکراوە کافرو بێباوەڕە بەم قور ئانە، جا ﷲ دڵنەوایی پێغەمبەرمانﷺ ئەکات و ئەفەرموێ:

(١٠) بەراستی لە ناو ئوممەتانی پێش تۆدا پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردوە، واتە: تەنها تۆ نیت کە ئێش و ئازارت بەسەردا هاتبێت بەڵکو،

(١١) نەهاتوە بۆئەوان هیچ پێغەمبەرێك مەگەر ئەوان بەچاوی سوك تەماشایان کردبێت و گاڵتەیان پێ کردبێت، جا تۆش هەروەك و ئەوانیت و نارەحەت مەبە.

(١٢) هەر ئاوا لەبەر لاساری خۆیان ئێمە کوفرو بت پەرستی ئەخەینە ناو دڵی ستەمکارانەوە،

(١٣) ئیتر ئەوانیش باوەڕ ناهێنن بەم قورئانەی کەرەوانەمان کردوتە لای تۆو هەر ڕۆژێك بەشێوەیەك ڕەخنەی لێ دەگرن بەراستی ڕەوشتی ﷲ بۆ لەناوبردنی تاوانباران و کافران دامەزراوەو ناگۆڕێت،واتە: ئەمانەش بەهۆی خراپی و کوفرو بت پەرستیانەوە زۆر نزیکن لە سزای ئێمەوە.

(١٤) جا ئەمانە ئەوەند بێباوەڕن ئەگەر ئێمە لە ئاسمانەوە دەرگایەکیان بۆ بکەینەوەو سەرکەون بۆ ئاسمانگ، لە باتی باوەڕهێنان،

(١٥) بەراستی دەڵێن: چاوی ئێمە تێکچوەو نابینێ ئەگینا ناگونجێت ئێمە سەر ئاسمانگ بکەوین و هەرگیز باوەڕمان بەو سەرکەوتنە نییە بەڵکو ئێمە جادومان لێ کراوە. واتە بێباوەڕان ئەوەندە سەر لێشێواون ئەگەر دەیان بەڵگەی ڕاست و ڕەوانیان پیشان بدرێت لەگومڕاهی و سەر لێشێواوی خۆیان واز ناهێنن و تەنها خۆیان بەلاوە ڕاستەوجگە لەخۆیانیان بەلاوە هەڵەو نادروستە، جا ئەی پەیڕەوانی محمدﷺ ئەرکی ئێوە گەیاندنی ئەم پەیامەیە بەخەڵك و کۆڵ نەدان و نەبەزینە ئیتر چۆن ڕەفتارتان لەگەڵ دا ئەکەرێت نائومێدو دڵ تەنگ مەبن و تەماشای دەسەڵات و هێزی ئێمە بکەن لەگەڵ ئەوەشدا پەلە ناکەین لە تۆڵەسەندنەوە لە تاوانباران و بێباوەڕان چونکە هەرچی بکەن هەردێنەوە بەردەستمان، ئینجا ﷲ هەندێ لە بەڵگەی دەسەڵات و هێزو یەکتایی خۆی پیشان ئەدات و ئەفەرموێ:

(١٦) ئەوسا بەحەقیقەت ئێمە لە ئاسماندا چەندین کۆشك و مەنزڵمان داناوە وجوان و ڕازاوەمان کردوە بۆ تەماشا چیان،

جا ﴿ بُرُوجًا ﴾ چ ئەو دوانزە بورجەبێ کەبە ( حمل، ثور، جوزاء، سرطان، اسد، سنبلة، میزان، عقرب، قوس، جدی، دلو، حوت)

وَلَقَدۡ جَعَلۡنَا فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَزَيَّنَّٰهَا لِلنَّٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظۡنَٰهَا مِن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسۡتَرَقَ ٱلسَّمۡعَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ مُّبِينٞ ﴿١٨﴾ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيۡءٖ مَّوۡزُونٖ ﴿١٩﴾ وَجَعَلۡنَا لَكُمۡ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسۡتُمۡ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٢١﴾ وَأَرۡسَلۡنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَسۡقَيۡنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمۡ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحۡنُ نُحۡيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحۡنُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَقۡدِمِينَ مِنكُمۡ وَلَقَدۡ عَلِمۡنَا ٱلۡمُسۡتَـٔۡخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحۡشُرُهُمۡۚ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٞ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٦﴾ وَٱلۡجَآنَّ خَلَقۡنَٰهُ مِن قَبۡلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذۡ قَالَ رَبُّكَ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّي خَٰلِقُۢ بَشَرٗا مِّن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيۡتُهُۥ وَنَفَخۡتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُواْ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمۡ أَجۡمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٣١﴾

ناو ئەبرێن یان قۆناغەکانی ڕۆژو مانگ یان جێگای ئەستێرەکان یان ئەمانەو هەزاران شتی نەناسرای تر بێت، ﷲ ئەم ئاسمانەی ئێمەی پێ ڕازاندوەتەوەو دەفەرموێ:

(١٧) ئێمە ئەو ئاسمانەمان پاراستوە لە هەمو شەیتانێکی دەرکراو لە ڕەحمەتی وسۆز ﷲ .

(١٨) مەگەر ئەو شەیتانانە کە بەدزیەوە شتێك وەرئەگرن لە مەئمورەکانی ئاسمان و ئەوانیش بەگورجی پارچە ئاگری ئاشکرا دوایان ئەکەوێت و ئەیانفڕێنێت، واتە: پاش هاتنی پێغەمبەری ئیسلام ﷺ شەیتانەکان ڕێگەی ئاسمانیان لێ گیراو ناتوانن سەرکەون و قسەو باسی فریشتەکان بزانن تەنها ماوەی گوێ گرتنیان پێ دراوە ئەویش لەبەر ئەو مەبەستەی کەﷲ هەرخۆی ئەیزانێت و خەڵکیشی پێ تاقی ئەکاتەوە چونکە ئەوانە قسەیەکی ڕاست ئەبیسن نەوەدو نۆ درۆیشی تێکەڵ ئەکەن و ئەیدەن بەگوێ جادو کەران و پێش بینی کەراندا، جا خەڵك کە دی قسەیەکی ئەوانە ڕاست دەرچو دوایان ئەکەون باوەڕیان پێ ئەکەن، ئینجاپاش باسی ئاسمان ﷲ باسی زەوی دەکات و ئەفەرموێ:

(١٩) خۆ ئێمە زەویشمان پان کردوەتەوە ودامانخستوە، وە لەناویدا چەندین چیایی بتەوو بەهێزمان داناوە بۆ بتەو کردنی زەوی و سەوزمان کردو ڕواندمان لە ناویدا هەمو شتێك بەئەندازەی دیاری کراو یان هەمو شتێکی کێشراو نەکێشراو.

(٢٠) جا ئێمە دامان نا بۆ ئێوە لەو زەوییەدا ئەو شتانەی کە پێ بژێویتانە لە خۆراکو لەپۆشاکو بۆ هیچ شتێك داناميٚنو رۆزیشمان داناوە بۆ ئەوانەش کە ئێوە ناتوانن رۆزییان پێ بدەن. لەوهەمو دروستکراوە گەورەو بچوکانە کە هەرﷲ خۆی ژمارەو شوێنی هەموویان ئەزانێ، ئینجا دەفەرموێ:

(٢١) خۆ هیچ شتێك نیە لەم بونەوەرەدا مەگەر عەماری دابین کردنی ژیانی لای ئێمەیەو خۆمان چاودێری ئەکەین وئەو رۆزیەش رەوانەی ناکەین مەگەر بەئەندازەی دیاری کراو، واتە: دەرگای عەمارو خەزێنەی خوا بەئەندازەی دیاری کراوو بەگوێرەی بەرنامەیەك کە ﷲ دایناوە ئاوەها دێتە سەر زەویو کەس پێی زیادو کەم ناکرێت، هەر بۆیە موسڵمانی چاك نەك وەکو ئێمە زۆر ئارامەو ئیرەیی بەکەس ناباتو هاواری کەمو زۆری خۆی ناکات چونکە ئەزانێ هەر ئەوەندە چاکە بۆی.

(٢٢) جا ئێمە بامان رەوانە کردوە بۆ بەردار کردنی زۆربەی درختەکانو هەورو هەمو دروستکراوەکانی تری خوا چونکە هیچی بێ هەوا سودی نابێ تەنانەت هاتو چۆی ئەو هەمو کەشتیو فرۆکە جۆراو جۆرانە کە ئەگەر هەوا نەبێ هەموی لە جێگای خۆیدا ئەمرێتو ئەپوکێتەوەو توانای جوڵەی نابێت بەڵکو ئەگەر هەوانە بێت هیچ گیان لەبەرورۆکێك نامێنێت، جا چونکە شتێکی پێویستە پەروەردگار نەیخستوەتە دەست کەسو بۆکەسیش نییە کە ئەو هەوایە پیس بکات چونکە هەمویان تێیدا هاوبەشن جا ئاومان لە ئاسمانەوە بۆرەوانە کردن ئەوسا ئاومان پێدانو بەراستی ئێوە ناتوانن ئەو ئاوە هەڵبگرنو عەمباری بکەن بەڵکوﷲ خۆی زەوی وادروست کردوە کە ئەو ئاوە هەڵگرێتو بەشێوەی کانی ئاوو روبارو بیرو دەریا دایبنێت بۆمرۆڤ تاسودی لێ وەرگرێت.

(٢٣) جا بێگومان هەر ئێمەین کە زیندو ئەکەینەوەو ئەمرێنینو هەر ئێمەشین کە ئەمێنینەوەو سەر ئەنجام هەمو شتەکان دەگەرێنەوە لامانو دەبنەوە بەموڵکی تایبەتی ئێمەو هیچ کەس بەخاوەنی هیچ شتێك نامێنێتەوەو هەمویان بەگەردنکەچی لەبەردەم ئێمەدا ئامادە دەکرێن.

(٢٤) ئەوسا ئێمە ئاگاداری ئەو کەسانەین کە پێش کەوتون لە ئێوە لە ژیاندا چ لە پلەو مەقامدا چ لە چاکەو بەندایەتی داو چ لە ریزی نوێژو جیهاددا، هەروەها ئێمە ئاگاداری ئەو کەسانەیشین کە دواکەوتوون لەو شتانەی کە باسکران. ئیبنوعەباس دەڵێ: ﴿كَانَتْ امْرَأَةٌ تُصَلِّي خَلْفَ رَسُولِ اللهِ ﷺ حَسْنَاءَ مِنْ أَحْسَنِ النَّاسِ فَكَانَ بَعْضُ الْقَوْمِ يَتَقَدَّمُ حَتَّى يَكُونَ فِي الصف الأول لِئَلَّا يَرَاهَا وَيَسْتَأْخِرُ بَعْضُهُمْ حَتَّى يَكُونَ فِي الصف الْمُؤَخر فَإِذَا رَكَعَ نَظَرَ مِنْ تَحْتِ إِبْطَيْهِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَقْدِمِينَ مِنْكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا الْمُسْتَأْخِرِينَ / ابن ماجه، النسائي، صححه الألبا / ئافرەتێکی جوان کە لە جوانترین ئافرەتان بو لە پشتی پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی دەخوێند، جا هەندێ لە خەڵك پێش دەکەوتن تا لە ریزی پێشدا بنو ئەو ئافرەتە نەبینن‌و هەندێکیش خۆیان پاش دەخست تاکو لە ریزی پاشدا بن جا کاتێك دەچون بە رکوعدا لە بن باڵیانەوە دەیانروانی، جا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێ: ئەوسا بێگومان ئێمە ئاگاداری ئەو کەسانەین کە پێش کەوتونو ئاگادارین لەوانەیش کەدواکەوتوون﴾.

(٢٥) خۆ بێگومان هەر پەروەردگارتە کە ئەوان کۆ ئەکاتەوە بۆ لێکۆڵینەوەو پاداش‌و سزا ، وە بێگومان دانایەو ئیشەکانی پڕ لە دانایی‌و حیکمەتەو زانیاری بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو کارەکانی لەسەر بناغەی دانایی‌و زانایيە نەك گۆترەکاری. ئینجا ﷲ باسی دروستکردنی مرۆڤمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٦) بەراستی مرۆڤمان لە وشکۆبوی قورێکی گۆڕاو دروست کردوە. دروستکردنی ئادەم بەم قۆناغانەدا رۆیشتوە پێشەکی {خاك پاشان قورئینجا قوری گۆڕاو،جا قوری ترشاو ئەوسا قوری وشکۆبو وبرژاو بەگەرما یان بەئاگر ئینجا گیانی تێکراوە، والله اعلم. ئینجا ئەفەرموێ:

(٢٧) ئەوسا جنۆکەیشمان دروستکرد لەپێش مرۆڤدا لە ئاگرێکی بێ دوکەڵ.

ئیمامی مسلم لەئەنەسەوە هێناویەتی کەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { لَمَّا صَوَّرَ اللَّهُ آدَمَ فِي الْجَنَّةِ تَرَكَهُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَتْرُكَهُ فَجَعَلَ إِبْلِيسُ يُطِيفُ بِهِ يَنْظُرُ مَا هُوَ فَلَمَّا رَآهُ أَجْوَفَ عَرَفَ أَنَّهُ خُلِقَ خَلْقًا لَا يَتَمَالَكُ /کاتێ کە ﷲ لە بەهەشتدا وێنەی ئادەمی کێشاوبەو ئەندازەیەی کەویستی وازی لێهێنا، جا شەیتا ئەسوڕا بەدەوریاو تەماشای ئەکرد تابزانێت ئەوە چییە جا کاتێ دی کە ناوی بۆشە، زانی کە ئەوە دروستکراوێکە کە خۆی پێ راگیرناکرێت}

(٢٨) جابیر بکەرەوەو باس بکە بۆ گەلەکەت ئەی محمدﷺ ئەو کاتەی کە پەروەردگارت بەفریشتەکانی وت: من ئەمەوێ مرۆڤێك دروست بکەم لە گڵی وشك کراوەی قورێکی گۆڕاو.

(٢٩) جا هەرکاتێ رێك وپێکم کردو لەو رۆحەی کەخۆم ئەزانم چییەو جۆنە بەوم بەخشیو گیانی تێکەوت ئێوەش رێزی بگرنو

سەری رێزو گەورەی بۆ نەوی کەن، جا خوا گیانی تێکرد وەکو مرۆڤێکی ئەمرۆیی.

(٣٠) جا لەوکاتەدا هەمو فریشتەکان سوجدیان بۆ بردو فەرمانی پەروەردگاری خۆیان ئەنجامدا،

(٣١) بێجگە لە شەیتان کە خۆی نەخستەناو سوجدە بەرانەوەو سوجدەی نەبرد.

(٣٢) ﷲ فەرموی: ئەی شەیتان بۆ تۆیش لەگەڵ ئەواندا سوجدەت نەبرد؟

(٣٣) شەیتان وتی: من سوجدە نابەم بۆ مرۆڤێك کە تۆ لە وشکۆ بوی قورێکی گۆڕاو بۆگەن دروستت کردوە، خۆی بەگەورە زانیو گوێرایەڵی فەرمانی خوای نەکرد.

(٣٤) ﷲ یش فەرموی: دەرچوە لە ناو ئەو باخو بەهەشتەدا بێگومان کەتۆ دەرکراوی لە رەحمەتی من.

(٣٥) ئەوسا بێگومان کە تۆ بەر نەفرین کەوتویت هەتا رۆژی لێکۆڵینەوەو حیساب.

(٣٦) شەیتان وتی: ئەی پەروەردگارم ماوەم پێ بدە هەتا ئەو رۆژەی کە زیندەوەران زیندوو دەکەیتەوە. دەی ویست بەم شێوەیە خۆی لەمردن رزگار بکات، چونکە دوای زیندوبونەوە تازە مردن نییە کە مردنیش نەبو حیساب نیە، بەڵام ئەگونجێت فێڵ لە خوا بکرێت؟ نەخێر ئەوەتە خوای زاناو دانا،

(٣٧) فەرموی تۆ یەکێکی لەوانەی کەماوەیان پێ ئەدرێت بەڵام نەك ماوەکەبەدەست تۆبێت بەڵکوئەوماوەبەدەست ئێمەیە.

(٣٨) هەتا کاتی رۆژی دیاری کراوە کە ئەویش پێش هاتنی قیامەتو کاول بوونی دنیایە.

(٣٩) شەیتان وتی: ئەی پەروەردگارم بەهۆی ئەوەی کە لەسەر ئەوان سەرت لێشێواندمو گومڕاهت کردم بەراستی من ژیانی ناو زەوییان بۆ جوان دەکەم وبەزیندەگیو ژیانی دنیاوە خەریکیان ئەکەم وهەمویان گومڕاو سەرلێ شێواو دەکەمو لە رێگای راست لایان دەدەم،

(٤٠) بێجگە لەو بەندانەت کە زۆر پاکو دڵسۆزبن بۆ بەندایەتیتو هەڵبژاردە بن من چاری ئەوانە ناکەمو ناتوانم بیانخەڵەتێنمو سەریان لێ تێك بدەم. جا ﷲ هەرِوشە لە شەیتانو پەیڕەوانی دەکات.

قَالَ يَٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّٰجِدِينَ (٣٢) قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَٰلٖ مِّنۡ حَمَإٖ مَّسۡنُونٖ (٣٣) قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٞ (٣٤) وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلدِّينِ (٣٥) قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ (٣٦) قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ (٣٧) إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ (٣٨) قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ (٣٩) إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ (٤٠) قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ (٤١) إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ (٤٢) وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ (٤٣) لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ (٤٤) إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ (٤٥) ٱدۡخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ (٤٦) وَنَزَعۡنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنۡ غِلٍّ إِخۡوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٖ مُّتَقَٰبِلِينَ (٤٧) لَا يَمَسُّهُمۡ فِيهَا نَصَبٞ وَمَا هُم مِّنۡهَا بِمُخۡرَجِينَ (٤٨) ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ (٤٩) وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ (٥٠) وَنَبِّئۡهُمۡ عَن ضَيۡفِ إِبۡرَٰهِيمَ (٥١)

(٤١) ئەفەرموێ: ئەمە رێگایەکی راستەو من پێویستم کردوە لەسەر خۆم کە رۆشنی بکەمەوەو سەر ئەنجام بەم رێگای ژیانەدا هیچ ئەم لاو لایەکتان پێ ناکرێ ئەبێ بێنەوە بەردەستی من .

(٤٢) بێگومان بەندەراستەو هەڵبژێراوەکانی من تۆ هیچ دەسەڵاتێکت بەسەریاندا نیە و ناتوانی بیانخەڵتێنیو هەڵیاندێریت مەگەر ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی تۆ دەکەنو بەشێکن لە سەر لێشێواو گومڕاکان.

(٤٣) ئەوسا بێگومان دۆزەخ شوێنی ئەوانەو هەمویان دەچنەناویەوە.

(٤٤) کە حەوت دەرگای هەیەو بۆ هەر دەرگایەکیش جەماعەتێکی دیاری کراوی خۆی هەیە کەلەو دەرگاوە ئەچنە ناو دۆزەخەوە، ئینجا هەروەکو باوی هەمیشەی قورئان پاش باسی خراپان باسی چاکانیش ئەکاتو ئەفەرموێ:

(٤٥) بێگومان ئەوانەی کە لە خوا دەترسن لە رۆژی قیامەتدا لە ناو باخچەکانو چاوگە ئاوەکانداو پێیان ئەوترێ :

(٤٦) بچنەناویەوەو بحسێنەوە بەسەلامەتیو بەئەمنو ئاسایشەوە نە نەخۆشی هەیەو نەکەم دەستیو نەترس ونەمردن ونە بینینی

إِذْ دَخَلُوا۟ عَلَيْهِ فَقَالُوا۟ سَلَـٰمًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَـٰمٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِى عَلَىٰٓ أَن مَّسَّنِىَ ٱلْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا۟ بَشَّرْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ ٱلْقَـٰنِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِۦٓ إِلَّا ٱلضَّآلُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَـٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَـٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَـٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَـٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَـٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾

شتی ناحەز تەنانەت خوای میهرەبان نایەڵێ کەس دڵی لەکەس عاجزبێ‌و ئەفەرموێ:

﴿٤٧﴾ وەهەرچی ڤین‌و رقێکیان هەبوە لەیەکتر لەدونیادا هەموی لە ناو دڵیاندا لادەبەین‌و پاکی دەکەینەوەو لەو رۆژەدا کەس لە کەس عاجز نییەو برای یەکترن‌و لەسەر تەختەکان دادەنیشن رووبەرووی یەکترو هەواڵ پرسی‌و چیرۆکی رابوردوی دنیایی خۆیان بۆ یەکتر باس ئەکەن.

﴿٤٨﴾ خۆ ئەوان لەو بەهە شتەدا هەرگیز نارەحەتیان تووش نابێت وەهەرگیز ئەوان لەو نازو نیعمەتانەدا دەرناکرێن.

﴿٤٩﴾ئەی محمدﷺ خەبەر بدە بەبندەکانم کە بەبێگومان هەر منم کەزۆر لێخۆشبوو میهرەبانم بۆ بەندەکانم.

﴿٥٠﴾ جا بێگومان سزایشم گەورەیەو هەر ئەوەیە سزای دەردناك.

خوای زاناو میهرەبان روداوێکی گرنگ‌و زۆر کۆنی ئیبراهیم پێغەمبەر ﵇ لێرەدا تۆمار دەکات‌و بە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ ئەفەرموێ:

﴿٥١﴾دەی هەواڵی میوانەکانی ئیبراهیمیان پێ بدە،

﴿٥٢﴾ ئەو کاتەی کە چوونە لای‌و سەلامیان لێ کرد - ئینجا پاش هێنانی گۆشتی برژاوی گوێرەکەو نەیانخوارد - ئەویش فەرموی بەراستی ئێمە لە ئێوە دەترسین، چونکە باوی عەرەب وابو ئەگەر کەسێك بوبە میوانی کەسێك‌و شتی نەخواردن بەڵگەی عاجز بونیە لەوماڵە بۆیە ئیبراهیمیش ﵇ فەرموی لێتان ئەترسین،

﴿٥٣﴾ جا ئەوانیش گوتیان: مەترسە بەراستی ئێمە موژدە ئەدەین بە تۆ بە منداڵێکی زۆر زانا،

﴿٥٤﴾ فەرموی ئێوە موژدەی منالّم پێ ئەدەن لەم سەری پیریەدا؟جا بە چی‌و چۆن موژدەی وام پێ ئەدەن؟!

﴿٥٥﴾ گوتیان: ئێمە موژدەی راستەقینەت پێ ئەدەین لەلایەن زاتی حەقەوە کە خوایەو نەکەی تۆ لەو کەسانە بیت کە نا ئومێدن‌و هیوایان بە سۆزو رەحمەتی خوا نەماوە.

﴿٥٦﴾ ئیبراهیم ﵇ فەرموی: بێجگە لە گومڕاهان کێ هەیە لە رەحمەتی ﷲ مەئیوس‌و نائومێد ببێت؟ سوپاس بۆ خوا کەمن گومڕاو نا ئومێد نیم لە سۆزو بەزەی ﷲ ، جا کەزانی ئەوان فریشتەن‌و رەوانە کراون، زانی هاتنی ئەوان هەروا سادە نیە،

﴿٥٧﴾ بۆیە فەرموی: دەی ئیشتان چیەو ئەو کارە گەورەیە چییە کە ئێوەی بۆ رەوانەکراوە؟

﴿٥٨﴾ وتیان: ئێمە رەوانەکراوین بۆ سزادانی گەلێکی تاوانبارو لە ناویان ئەبەین.

﴿٥٩﴾بێجگە لە پەیرەوانی لووت ﵇ کە بەراستی ئێمە هەمویان رزگار ئەکەین.

﴿٦٠﴾بێجگە لە ژنەکەی کە بڕیارمان داوە کەلەو کەسانە بێت کە ئەمێننەوە بۆ سزا، چونکە ئافرەتێکی بێباوەڕو نیەت پیس‌و لایەنگری ئەوگەلە پیسەیە، ئینجا بەرەو لووت رۆیشتن.

﴿٦١﴾ جا کاتێك ئەو نێرراوانە هاتنە لای دەست ودایەرەی لووت،

﴿٦٢﴾ لووت وتی﵇: بەراستی ئێوە گەلێکی نەناسراون لەلای ئێمە.

﴿٦٣﴾ وتیان: بەڵێ راستە کەئێمە ناناسیت بەڵام ئێمە هاتوین بۆلای تۆ بۆ ئەنجامدانی سزایەك کەئەوان گومانیان لە هاتنیدابو، نە تۆیان بەراست ئەزانی نە هاتنی ئەو سزایەش.

﴿٦٤﴾ وتیان: ئێمە بۆ مەبەستێکی دروست کەسزای ئەم گەلەیە هاتوینە لای تۆو بێگومان ئێمە راست ئەکەین لەو ڤسانەی کە بە تۆی دەڵێین.

(٦٥) جا هەر ئەمشەو خاو خێزانو پەیڕەوانی خۆت ببەو خۆت دوایان بکەوەو با هیچ کام لە ئێوە لانەکاتەوە بۆ لای ئەو گەلەو پەلە بکەنو بڕۆن بۆ کوێ ئەمرتان پێ دەکرێت، لەوە دەچێ کە مەئموریان لەگەڵدا بوبێ بۆ ڕێنمای کردنیان کە بۆ کوێ بچن،

(٦٦) ئەوسا ئێمە وەحیمان کردە لایو تێمانگەیان لەو بڕیارەی خۆمان کە بێگومان ئا ئەوانە لەگەڵ هاتنی بەیانیدا دوایان دێتو لەناو ئەبرێن. ئەمە قسەی فریشتەکان بو بۆ لووت بەڵام بەر لەو قسەو باسە ئەو گەلە ناپاکەی لوت کاتێ کە ئەوچەند گەنجەیان دی کەهاتنە ماڵی لووت ﷷ ، بەناوخۆیاندا جاڕیاندا وهەواڵی ئەومێوانانەیان بڵاو دەکردەوە وەك خوای باڵادەست دەفەرموێ:

(٦٧) جاخەڵکی شارەکە بەکەیف وشادییەوە موژدەیان بەیەکتر ئەداو هاتن بۆ ماڵی لووتو داوایان لێ کرد کە ئەو میوانانەی بداتە دەستیان.

(٦٨) وتی بێگومان ئەمانە میوانی منن، دەی لەم داوا بێ نرخو قێزەونەتان واز بهێننو ئابڕووم مەبەن.

(٦٩) وە لە خوا بترسنو عەیبدارو سەرشۆڕم مەکەن.

(٧٠) وتیان: مەگەر ئێمە بەتۆمان نەوت کە بەرگریمان مەکە لە خەڵكو پارێزگاری لەکەس مەکەو میوان رامەگرە؟ تەماشاکەن بێباوەڕان چەند لوت بەرزنوخۆیان پێ هەموشتێکەوکەس مافی ڕێگری ئەوانی نیە!

(٧١) وتی: ئا ئەوانە کچانی مننوپاكو خاوێننو بە حەڵاڵی هەر یەکەیان ئەدەم بەسەرۆکی تیرەیەکتانو واز لەم ئیشە پیسە بهێنن، بەڵام قسەکانی هیچ سودی نەبو زیاتر خەریك بون بە زۆر بێنە ژورەوەو وەکو لە پێشەوە لە سورەتی ئیبراهیم ﷷدا باسمان کرد، ئا لەو کاتەدا فریشتەکان خۆیان بەلووت ناساند، ئینجا الله دەفەرموێ:

(٧٢) بەگیانی تۆ ئەی محمد ﷺ ئەوان لەناو دەریای سەرخۆشی خۆیاندان زۆر بێ ئاگاو سەرگەردانن، لەبەر ئارەزواتیان هیچیان لەبیر نەماوە!

(٧٣) جا لەکاتی هەڵهاتنی ڕۆژدا دەنگێکی گەورەدای بەسەریانداو هەمویانی گرتەوەو هیچیان ڕزگار نەبون، وەك خوای زاناو دانا ئەفەرموێ:

(٧٤) وڵاتمان لێتێکدانو سەرو بنمان کردن وبەرد بارانمان کردن بەردێك کەلە قوڕ دروستکرابوو.

قَالَ هَٰٓؤُلَآءِ بَنَاتِيٓ إِن كُنتُمۡ فَٰعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمۡرُكَ إِنَّهُمۡ لَفِي سَكۡرَتِهِمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٧٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُشۡرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلۡنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمۡطَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ حِجَارَةٗ مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٖ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدۡ كَذَّبَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡحِجۡرِ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمۡ ءَايَٰتِنَا فَكَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُواْ يَنۡحِتُونَ مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتًا ءَامِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلصَّيۡحَةُ مُصۡبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَإِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞۖ فَٱصۡفَحِ ٱلصَّفۡحَ ٱلۡجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨٦﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَٰكَ سَبۡعٗا مِّنَ ٱلۡمَثَانِي وَٱلۡقُرۡءَانَ ٱلۡعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلۡ إِنِّيٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَى ٱلۡمُقۡتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾

(٧٥) بێگومان ئا لەم داستانەدا چەندین بەڵگە هەیە لەسەر دەسەڵاتو هێزو سزای ناکاوی ﷲ بۆ ئەوانەی فامو دەرکی شتیان هەیەو لە ﷲ ئەترسنو پەیڕەوی دەکەن، وەئەفەرموێ:

(٧٦) بێگومان ئا ئەو دیهاتانەی کە ئێمە لەناومان بردن لەسەر ڕێگای هاتوچۆی ئەم خەڵکەی مەکەیەو بەچاکی شوێنەوارەکانیان دیوە لەکاتی کاروان کردنیان بۆ شام. ئیتر بۆ ئەبێ پەندو ئامۆژگاری لێ وەرنەگرن؟ جا هەر چەند ئەوان سود لەو شوێنەوارانەش وەرنەگرن کەروی داوە خەڵکی تر سودی لێ وەرئەگرێت وەکو ئەفەرموێ:

(٧٧) ئا لەوێدا بەڵگەی زۆر گەورە هەیە بۆ ئیمانداراندێك کە تەماشا ئەکەنو سودی لێ وەرئەگرن، چونکە ئەبینن کە کافرو ستەمکار هەمیشە بەرەو هەڵدێرو نەمان چوون، وە باوەڕدارانیش ڕزگاربوون ئەمە ئەبێت بەهۆی ئەوە کە زیاتر لە ﷲ بترسنو جوانتر بەندایەتی بۆ بکەن، ئینجا ﷲ بەکورتی باسی گەلی شوعەیب ﷷ ئەکاتو ئەفەرموێ:

(٧٨) بەراستی خاوەنانی بێشەو دارستانەکان کەگەلی شوعەیبە ستەمکار بوون بەتایبەت لە کێشانەو پێوانەدا.

(٧٩) جا ئێمەش تۆڵەمان لێ سەندنو بوون بە پەندو داستانی پاش خۆیان وئەم دوو گەلە، واتە گەلی لووتو گەلی شوعەیب

لەسەر ڕێگایەکی ڕون و ئاشکران و هەرکەس بەو ناوچەدا بڕوات دەیان بینێت و لەیەك نزیکن، ئینجا اللّٰه هەروا بە کورتی داستانی گەلی سەمود کە گەلی ساڵح پێغەمبەرە ﷺ بوە باس ئەکات و ئەفەرموێ:

(٨٠) بەڕاستی خەڵکی حیجر کەگەلی سەمودەو ساڵح پێغەمبەر ﷺ لەسەر داخوازی گەلەکەی بەفەرمانی خوا لە بەردێك وشترێکی بۆ هێنانەدەرەوە کە موعجیزەیەکی گەورەبو بۆ باوەڕ هێنانیان بە اللّٰه و بە پێغەمبەرەکەی کەچی باوەڕیان بە پێغەمبەران نەکرد، هەرچەندە ساڵح تەنها یەك پێغەمبەر بو بەڵام باوەڕ نەکردن بەیەك پێغەمبەر باوەڕ نەکردنە بەهەمو پێغەمبەران بۆیە وای فەرموە.

حیجر جێگایەکە لەنێوان شام و حیجازدا پێغەمبەرﷺ لە غەزای تەبووکدا کاتێ کە هاتە ئەو جێگایەو یارەکانی هەویریان بەئاوی بیرەکانی شێلا بوو ئاویشیان دەرهێنا بو بۆ خواردنەوە فەرمانی داکە{ أنْ يَطْرَحُوا ذَلِكَ الْعجِ َ وَيُهَرِيقُوا ذَلِكَ الْمَاءَ [البخارى ومسلم] هەویرەکە فڕە بدەن و ئاوەکە بڕژێنن } وەفەرموی:{ لَا تَدْخُلُوا مَسَاكِنَ الذِينَ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ إِلا أَنْ تَكُونُوا بَاكِ َ حَذَرًا أَنْ يُصِيبَكُمْ مِثْلُ مَا أَصَابَهُمْ ثُم زَجَرَ فَأَسْرَعَ حَتى خَلَفَهَا.[متفق عليه] مەچنە ناوجێگای ئەوکەسانەی کە ستەمیان لەخۆیان کردوەو سزادراون مەگەر بە گریانەوە نەوەك دوچاری ئێوەیش ببێت وەك ئەوەی کە دوچاری ئەوان بووە، پاشان لە وشترەکەی خوڕی و بەپەلەڕۆیشت تا ئەو جێگایەی بە جێهێشت }

(٨١) خۆ ئێمە نیشانەکانی خۆمان پێدان بەڵام ئەوان پشتیان تێکردو وازیان لێ هێنا.

(٨٢) جا ئەوان لە چیاکانماڵیان ئەتاشی بۆ خۆیان و ئەشکەوتیان دروست ئەکردو بێ ترس بوون لە دەست درێژی خەڵك و لە بومەلەرزەو وازیان لەخوا پەرستی هێناو دژی ساڵح وەستان و وشترەکەیان کوشت.

(٨٣) جا ئەمانیش هەر لەکاتی بەیانیدا دەنگێکی گەورە دای بەسەریانداو هەمویانی پارچە پارچەو وردوهان کرد، واتە: خانوە بتەوو گرنگەکانیان نەی پاراستن لە تۆڵەو سزای اللّٰه .

(٨٤) خۆ ئەوەی کە ئەوان بەدەستیان هێنابو لە ماڵ و سەروەت و سامان و ئەولاد هیچ سودێکی بەوان نەداو بەوسزا گەورە هەلۆ گیر بون لە دنیاداو سزای گەورەی دوارۆژیش چاوەڕێیانە، ئینجا اللّٰه جارێکی تر دڵەکان ڕائەتەکێنێ و ئەفەرموێ وانەزانن کە ئەم زەوی و ئاسمانە هەروا بێهودە دروستکراون و حیساب و لێکۆڵینەوەیەك لەئارادا نیەو ئەفەرموێ:

(٨٥) بەڕاستی ئێمە ئاسمانان وزەوی و ئەوەی کەلە نێوانیاندایە دروستمان نەکردون مەگەر بۆ مەبەستێکی دروست وراست کە سەرەنجامیان نەمان و لەناو چونیانەو بێگومان کە قیامەت دێت، جا تۆ ئەی محمدﷺ پشتیان تێ بکە بەپشتێکردنێکی جوان، واتە: قسەیان پێ مەڵێ و جنێویان پێ مەدەو ناڕەحەتیان مەکە تۆ تەنها ڕاگەیاندنی ئەم پەیامەت لەسەرە، دیارە ئەمە لەسەردمی مەکەدا بوە کە هێشتا جیهاد پێویست و واجب نەبوەو بەفەرمان بەجیهاد حوکمی ئەم جۆرە بڕیارانە هەڵگیراوەو ئەبێ بەرامبەر بەرێگرانی ئایین و دژایەتی کەرانی هەنگاوی وەکو خۆیان بۆ بنێرێت و وەڵامی توندیان بدرێتەوە.

(٨٦) بێگومان پەروەردگارت هەر خۆی دروستکەرەو هەر خۆیەتی زۆر زانا، واتە: هەمو دروستکراوەکان مەخلوقی خودان و هەمویشی لەڕوی زانیاریەوە دروستکردوە، ئینجا خوای زانا باسی ئەو نیعمەتە گەورە ئەکات کەداویێتی بەپێغەمبەری ئازیزمانﷺ و ئەفەرموێ:

(٨٧) بەڕاستی ئەی محمد ﷺ ئێمە دامان بەتۆ حەوتێك کە دووبارە دەبێتەوە یان حەوتێك کەوا سوپاس و ستایشی خوا دەکات، وەهەندێك ئەو حەوتە بەسورەتی فاتیحە ئەزانێت کە هەمیشە لەنوێژەکاندا دووبارە ئەبێتەوەو سوپاس و ستایشی خودایشی تێدایە، وەچەند مانای تریان لەم بارەوە وتووە وەکو حەوت سورەتە درێژەکانی قورئان(البقرة، آل عمران، والنساء، وا ائدة، والانعام، والاعراف،ويونس) وە لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا هاتوە کە(ا مد أم الْقُرْآن هِيَ السبْعُ الْمَثَانِي وَالْقُرْآنُ الْعَظِيمُ/البخاري والترمذي / سورەتی الحمدللّٰه بناغەی ئەم قورئانەیەو بناغەی ئەم پەڕاوەیەو حەوتێکە کە دووبارە ئەکرێنەوە. جا بەو مانایە لەپاشدا ئەفەرموێ وەقورئانی گەورەمان پێدایت، باسی تایبەت ئینجا گشتی (ذکر العام بعد ا اص) لەبەر گەورەی و پرسودی فاتیحەیە بۆیە باسیکردوە ئینجا باسی قورئانی کردوەو ئەم باسە لە سورەتی فاتیحەدا بەدرێژتر باسکراوە.جا اللّٰه ئەفەرموێ: ئێمە ئەو نیعمەتە گەورەمان بەتۆ داوە کەواتە تۆ بەکەیف و خۆشی ژیانی دنیا دڵ مەبەستە.

(٨٨) تۆ چاوت نەنوارێت بۆ ئەو شتەی کە ئێمە کردومانە بەهۆی ژیان و ڕابواردنی تاقم و پێرە هاوچەشن وهاوبیرو باوەڕەکانی بێباوەڕان و خوانەناسان، واتە گوێ بە زرق و برقی دنیا مەدە وخەفەت مەخۆ لەسەر ئەوەی کەچییان بەسەردێت وبالی

میهرەبانیت راکێشە بۆ ئیمانداران، واتە تۆ بەنەرمی لەگەڵیاندا رەفتار بکەو قسەی نەرمیان لەگەڵ بکە تا زیاتر خۆگرو دڵسۆز تربن بۆ خۆتو بۆ بەرنامەکەت. پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ئەفەرموێ:{ حُببَ إلَی مِنْ دُنْیاکُمُ النسَاءُ وَالطیبُ وَجُعِلتْ قُرةُ عَیْنِیَ فِی الصلاَةِ / أ د ، النسائی، صححە الالبا / خۆشەویست کراوە لای من لە دنیای ئێوەدا ئافرتو بۆن خۆشی، وە چاو رۆشنی وفێنکی دڵم لە ناو نوێژ دایە.

(٨٩) جا بڵێ بەراستی من ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە وئەگەر پەیرەوی ئەم قورئانە نەکەن دوچاری سزای هەردوو ژیان ئەبن وەکو گەلانی پێش خۆتان،

(٩٠) ئەوسا ئەم قورئانەمان نازڵ کردە لای تۆ هەروەك چۆن پەیامان نارد بۆ ئەوکەسانەی کە پەیامەکەی خۆیان بەشبەشکردو هەریەکەی بەشێکی بۆ خۆی کە سودی خۆی تێدا ئەبینی هەڵ ئەبژاردو پەیرەوی ئەکردو ئەوی تری بەراست نەئەزانیو زۆر جار سوێندیان ئەخوارد لەسەر دژایەتی پێغەمبەرەکانیان وسوێندیان ئەخوارد کە زیندو بونەوە نیەو ئەیان وت: دنیا دوای نایەتو سوێندیان ئەخوارد کە خوا هەرگیز باوەڕداران لە خەیرو خۆشی دا بەشدار ناکات بەکورتی هەرچی بەبیرو باوەڕی خۆیان نەدەگونجا سوێندیان لەسەر ئەخوارد کە راست نیەو خەڵکیان لێ ئەتاراند.

(٩١) ئەو کەسانەی کە ئەم قورئانوئەم پەڕاوەی خوایان بە چەند بەش دابەش ئەکردو هەندێکیان ئەیان وت: شیعرەو هەندێك ئەیانوت: سیحرەو هەندێك دەیانگوت: قسەی کاهینو پێشبینی کەرانە، جا ﷲ هەڕەشەیان لێ ئەکات وئەفەرموێ:

(٩٢) سابەپەروەردگارت قەسەم ئەی محمدﷺ پرسیار ئەکەم لە هەموویان،

(٩٣) لەو شتانەی کە کردویانەو هیچ شتێك لە ئێمە پەنهانی نابێ ولە دەستمان دەرناچێت پرسیار لەهەموویان ئەکەینو کەسیان نابوێرینو لە هەمو کردارەکانیان لەگەورەو بچووك، چاكو خراپیان ئەکۆڵینەوەو هەمو یەکێك لەوان بەرهەمی کرداری خۆی ئەبینێ، جاتۆ دڵگران مەبەو دان بە خۆتا بگرەو پەیامی خۆت هەڵگرەو بێ باکانە لەکەس مەترسە،

(٩٤) قسەی خۆت بەوشێوەیەی کە فەرمانت پێ کراوە ئاشکرای بکە وگوێ مەدە بەهەڕەشەوگوڕەشەی بت پەرستانوبەجوانی قسەی خۆت بکەو پشتیان تێ بکەو لێیان مەترسە،

(٩٥) چونکە بەبێگومان ئێمە بەسین بۆیارمەتیوپارێزگاری تۆو بۆ لەناوبردنی ئەوکەسانەی کەگاڵتە بە تۆو بەئاینەکەت دەکەن،

ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَـٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَـٰهًا ءَاخَرَ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

## سُورَةُ النَّحلِ

١٦ — ١٢٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ تَعَـٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾ وَٱلْأَنْعَـٰمَ خَلَقَهَا ۗ لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَـٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾

واتە :غەمگین مەبە چونکە تۆ خاوەنی پشتو پەنایەکی بەهێزی بەڵام بت پەرستانو بێباوەران هیچ دۆستو پەنادەرێکیان نیەو خوا تورەیە لێیان،

(٩٦) چونکە ئەوانەی لەگەڵ ﷲ دا چەندین خوای تریان بەناڕەوا داناوەو بەندایەتیان بۆئەکەن وائەزانن کە ئەو خودایانە ئەتوانن یارمەتیو کۆمەکیان بکەنو لە پاشە رۆژدا لە سزای خوا رزگاریان بکەن، ئەوسا بەم زوانە چییان کردوە تۆڵەکەی ئەبینن. جا ئەم رەفتارە ناپەسەندەی ئەوان ﷲ ی خاوەن هێزو بێ نیازو بێ هاوەڵی تورەکردوە، جائیتر ئایا ئەوان دەبێ بترسن یان تۆ ئەی محمدﷺ؟

(٩٧) بەحەقیقەت ئێمە ئەزانین بەو قسە ناشرینانەی کە ئەیکەنو دڵی تۆ نارەحەت ئەکەن، بەڵام تۆ خۆگربەو پەیامی خۆت بەڕۆشنی راگەیەنەو باکت لە تانەو تەشەری ئەوخوانەناسانە نەبێت.

(٩٨) سا تۆ خوای خۆت بەپاكو خاوێنی راگرەو سوپاسی بکەو تۆ لەو کەسانەبە کە بەندایەتیو نوێژ ئەکەن بۆ ﷲ و سەری بەندایەتی بۆ ئەخەنە سەرخاك.

(٩٩) جا بەندایەتی پەروەردگارت بکە هەتا ئەمریت، کەتەنها ئەوە لەسەر تۆ پێویستەو کۆتای نەکەیت تا دەمریتو بەخزمەت خوای خۆت ئەگەییت.

وَتَحۡمِلُ أَثۡقَالَكُمۡ إِلَىٰ بَلَدٖ لَّمۡ تَكُونُواْ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلۡأَنفُسِۚ إِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٧﴾ وَٱلۡخَيۡلَ وَٱلۡبِغَالَ وَٱلۡحَمِيرَ لِتَرۡكَبُوهَا وَزِينَةٗۚ وَيَخۡلُقُ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصۡدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنۡهَا جَآئِرٞۚ وَلَوۡ شَآءَ لَهَدَىٰكُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٩﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗۖ لَّكُم مِّنۡهُ شَرَابٞ وَمِنۡهُ شَجَرٞ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنۢبِتُ لَكُم بِهِ ٱلزَّرۡعَ وَٱلزَّيۡتُونَ وَٱلنَّخِيلَ وَٱلۡأَعۡنَٰبَ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ وَٱلنُّجُومُ مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾

## ١٦ سورەتی نەحل ١٢٨

سورەتی نەحل کە سورەتی شانزەهەمی قورئانە، سەدو بیستو هەشت ئایەتە، لە مەکە دا هاتوەتە خوارەوە جگە لە سێ ئایەت نەبێت لە لە ئایەتی سەدوبیستوشەشەوە دەست پێدەکات تا کۆتای سورەتەکە، وتراوە لە بارەی حەمزەو شەڕی ئوحدەوە هاتوە لەسەر قسەی عەبدوڵای کوری عەباس، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی حەفتاو دووهەمەو پاش سورەتی (**الأنبياء**)و پێش (**السجدة**) دابەزیوە.

ئەم سورەتەیش وەك زۆربەی سورەتە مەکەییەکان زۆرتر لەبارەی شتە بناغەییەکانی ئاینی ئیسلامەوە دەدوێت کە بەیەکخواپەرستی‌و قیامەتو پێغەمبەرایەتی (**ا بدأ،ا عاد،النبوة**) ناو دەبرێت وە ئەم سورەتە هەروەها ناوبراوە بەسورەتی(**النعم**) واتە نیعمەتەکان.

وەشەی (**النحل**) لە قورئاندا تەنها یەکجار ئەویش لەم سورەتەدا هاتوە.

بەناوی اللّٰهی زۆر بەسۆزو بێنهایەت میهرەبان

﴿١﴾ فەرمانی خوا هات جا پەلەی بۆ مەکەن، وە ئەو زاتە لەزاتو سیفاتو کرداریدا لەهەمو عەیبو ناڕێکییەك پاكو خاوێنەو بەرزە لەو هاوبەشی‌و هاوتاییەی کە ئێوە بۆی دادەنێن، ئەگەرچی هێشتا قیامەت نەهاتوە بەڵام ئەوەندە راستو نزیکە وەك ئەوە وایە کە هات بێت، جا بۆیە دەفەرموێت: ﴿أَتَىٰٓ أَمۡرُ ٱللَّهِ﴾ واتە: قیامەت هات، پاش باسی هاتنی قیامەت ویەکخواپەرستی دەچێتە سەر باسی پێغەمبەرایەتی‌و دەفەرموێ:

﴿٢﴾ فریشتەی پەیام رەسێن کە جبرئیلە رەوانە دەکات بۆ گەیاندنی وەحی کە مایەی ژیانەو بووژانەوەیە بە هەندێك لە فەرمانی خۆی بۆسەر ئەو کەسەی کە خۆی ویستی لەسەر بێت لە بەندەکانی کە پێغەمبەرانن بۆ ئەوەی کە خەڵك بترسێنن لە بت پەرستی‌و شیركو وریایان بکەنەوە کە هیچ پەرستراوێکی راستەقینە نیە جگە لە من، جا لە من بترسنو خۆتان لەسزای من بپارێزن، چونکە تەنها هەر خۆیەتی کە بەدی هێنەری هەمو بونەوەرەو بەخشێنەری هەمو نیعمەتەکانە.

﴿٣﴾ اللّٰه ئاسمانانو زەوی دروست کردوە بۆ مەبەستێکی راست کە جێگای ژیانی مرۆڤ بێت تا ماوەیەکی دیاری کراوو نیشانە گەلێکیش بن لەسەر دەسەڵاتی ئەو زاتە کە وابو ئاسمانو زەوی‌و ئەوەی کە تێیدایە کە مرۆڤیش یەکێك لەوانە بە بێ هودەو بە بێ مەبەستێکی گرنگ دروستی نەکردوون، اللّٰه بەرزو بێ نیازە لەو هاوبەش دانانەی ئێوە بۆی.

﴿٤﴾ خوا مرۆڤی دروستکردوە لەو تۆماوە بێ هێزو بێ دەسەڵاتەو کردویەتی بەم ئینسانە کەچی ئەو ئینسانە دوژمنێکی ئاشکرایە بۆ خواو پێغەمبەرانی‌و ڕێبازەکەی، هەمان قسە لە ئایەتی هەشتاوهەشتی سورەتی (یس) بەڕوونتر هاتوە، جا بە درێژی باسی نیعمەتەکانی خۆی دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٥﴾ جا خوای گەورەو باڵادەست مەڕو ماڵاتی دروست کردوە بۆ ئێوە لەو مەڕو ماڵاتانەدا هۆکاری خۆ گەرم کردنەوەو پۆشاكو ئەوەی پێویست بێ بۆ ژیان دایناوە بۆتان، وە لە ماستو شیرو گۆشتی هەندێکیشیان دەخۆن،

﴿٦﴾ خۆ لەو مەڕو ماڵاتانەدا بۆ ئێوە جوانی‌و خۆشی هەیە بەتایبەت لەکاتی ئێواران کەدێنەوە بۆ ماڵ، وەلە کاتی بەیانیاندا کەلە ماڵ دەریان دەکەن بۆ لەوەڕ کە تەماشا کردنیان بۆ خاوەنەکانیان زۆر خۆشەو دڵڕفێنە.

﴿٧﴾ جا بارە قورسەکانیشتان هەڵ دەگەرن بۆ جێگاو وڵاتانێك کە ئەگەر ئەومەڕو ماڵاتو حەیوانە بارکێشانە نەبوایە ئێوە ئاوا بەئاسانی بەو شوێنانە نەدەگەیشتن مەگەر زۆر بەزەحمەتدانی خۆتان، واتە: خوا ئەو حەیوانانەی رامو گەردنکەچ کردوە بۆ ئینسان تا ئیشەکانی خۆی لەم دنیادا بەئاسانی ئەنجام بدات، چونکە بەراستی پەروەردگاری ئێوە زۆر میهرەبانو زۆر

بەبەزەیو بەرەحمە بۆتان، ئەوەتە ئەو پەروەردگارە ئەو هەموو گیانلەبەرەی دروستکردووەو رامی کردون بۆتان تا ئێوە سودیان لێ وەربگرن .

(٨) جا ئەسپو ماینو ئێستر وەگوێدرێژی دروستکردووە بۆ ئەوەی سواریان ببن بۆکاروانو ئازوگویاز، وەبۆ جوان کردنورازانەوەی ژیانی دنیاتان، وەلەمەولایش شتانێکتان بۆ دروست دەکات بۆ ئازوگویاز کە ئێوە ئیستا نایزانن. بەڵێ، سەیارەو فەتارو فرۆکە لەو شتانەن کە لەو سەردەمەدا مرۆڤ لێی بێ ئاگا بوە کە ئیستا ئینسان بەهۆی بەکار هێنانی ئەو ژیریو عەقڵەوە کە ﷲ پێی داوە وا لەم سەردەمەدا دروستیکردوون، وە خوا دەزانێت چ شتانێکی تر دروست دەکرێت کە ئیستا ئێمە لێی بێئاگایین، بەراستی دروستکردنی ئاسمانانو زەویو ئەو هەموو نیعمەتە جۆراوجۆرو زۆرە هەمووی بۆ ئەوەیە کە ئەم مرۆڤە کەڵکی لێ وەگرێتو لە چاکەدا بەکاری بهێنێت، وە هۆکارێکیشن بۆ تاقی کردنەوەی مرۆڤ، جا پەوەردگاری میهرەبان لەگەڵ ئەو هەموو ئاسانکاریانەی کەلەم بونەوەرەدا بۆ ئەم مرۆڤەی دروستکردوە پێغەمبەرانو پەیامیشی بۆ ناردوون تا بزانن چاکو خراپ کامەیەو، وە ئەمەیشی لەسەر خۆی پێویستکردوە و دەفەرموێ:

(٩) رێگای راست پیشاندان لە سەر ﷲ خۆیەتیو خۆیشی پێویستی کردوە لەسەر خۆی کە رێی راست رۆشن بکاتەوە بۆ بەندەکانیو لەو رێگایانەی کە مرۆڤ و جنۆکە دەیگرێنە بەر بێجگە لەو رێگا راستە ئەوانی تریان لارو هەڵدێرن،جا بۆیە (ﷲ)پێویستی کردوە لەسەر خۆی کە رێگای راست رۆشن بکاتەوە، ئینجا بە رۆشنکردنەوەو پیشاندانی رێگای راست رێگای هەڵدێریش دەردەکەوێت، وە ئەگەر ﷲ بییەوێت هەموتان هیدایەت دەداتو دەتانخاتە سەر راستە رێگا بەڵام خوا ئەو ئارەزۆیە ناکات چونکە خوا بۆیە مرۆڤی دروستکردوە تا تاقی بکاتەوەو هۆیەکانی تاقی کردنەوەشی خستوەتە بەردەمیانەوە ئیتر هەرکەس بۆ خۆی سەرپشك کراوە کەکام رێگا دەگەرێتە بەر کە لەراستیدا دوو رێگایە،راستو ناراست کەدووهەمیان سەدان بەشی جیاجیاودژبەیەکی هەیەو یەکەمیان کەرێگای راستە، هیچ بەش بەشیو پارچە پارچەیی تێدا دروست نیەو پەروەردگار بەلوتفی خۆی رۆشنی کردوەتەوە بە شێوەیەك کەهیچ کەسێك لەرۆژی دواییدا بەهانەی نەمێنێت، جا هەر کەسێك ئەگەر ئەو رێگا راستەی بەو شێوەیە نەگرت ئیتر ئەوە لەسەر هەڵەیە هەر کەس ببیتو هەرچی بکات، بەراستی ئەو رێگا رۆشنکردنەوەش گەورەترین نیعمەتی خودایە.

(١٠) خۆ ﷲ ئەو زاتەیە کەلە ئاسمانەوە ئاو دەنێرێ بۆ ئێوە کەلەو ئاوە هەندێکی بۆ خوارنەوەیەو شیرینەو هەندێکی هۆی سەوزبونی درختو گژو گێایەکە کە ئێوە مەرِو ماڵاتەکانتان لە ناوی دا دەلەوەرێنو دەیدەن بە ئاژەڵەکانتان، جا هەندێکی دەبێ بەشیرو گۆشت بۆتانو هەندێکی دەبێت بەهۆی بەهێز بوونی ئەو حەیوانانەی کەلەکاتی کاروانو ئازوگویازدا باریان پێ هەڵ دەگرنو سواریان دەبن وەك لە پێشەوە فەرموی، بەراستی ئەگەر ئاو نەبێ هیچ شتێك سەوز نابێ بەڵکو کەسیش بێ ئاو ناژی کەواتە ئاو یەکێکە لە نیعمەتە هەرە گەورەکانی خواو هەموشت نیازی بەو هەیەو خوایش بەگوێرەی نیازی ئەم بونەوەرە ئاو دەنێرێ، پاشان قورئان ئاماژە دەکات بۆ هەندێ لەو درختە بەسودانەو دەفەرموێ:

(١١) خوا بەو ئاوە شینایو درختی زەیتونو خورماو ترێکان بۆ ئێوە سەوز دەکاتولە هەمو بەرو بومێك بەو ئاوە بەئێوە دەدات بەراستی ئا لەوەدا بەڵگەیەکی زۆر گەورە هەیە بۆ ئەو گەلەی کە بیر بکاتەوە کە چۆن ئەو هەمو میوە جۆراو جۆرە لەو دارەرِەقە کەلە سەر یەك زەوینو بەیەك ئاو، ئاودێری دەکرێن کەچی هەریەکە رنگیو هەریەکەی تامێ دەدات.

(١٢) جا رام وگەردنکەچمان کردوە بۆتان شەوو رۆژو مانگ کە بەگوێرەی پێویستی ئێوە کاردەکەن، وەئەستێرەکانیش بەفەرمانی ئەو زاتە رامو گەردنکەچن بەراستی ئالەوەدا چەندین بەڵگەهەیە بۆ ئەو گەلەی کەبیر بکەنەوەو ژیریان بخەنەکارەوە کە چۆن پەروەردگار خۆرو مانگو ئەستێرەکانی وا دروستکردووەو وا رێكوپێکی کردوە کە لە بەرژەوەندی ژیانی سەر زەویدا بێت.

(١٣) رامو گەردنکەچی کردوە بۆتانو دەتوانن سوودیان لێ وەرگرن ئەوەی کە دروستی کردوە لەزەویدا کە رنگەکانیان لە یەك جیایە، وە ئەو جیایی رەنگە بەتایبەت لە حەیواند خزمەتێکی گەورەیە بەمرۆڤ کراوە تا هەر کەس بە ئاسانی حەیوانی خۆی بناسێت بەراستی لەوەدا بەڵگەی گەورە هەیە بۆ ئەو گەلەی بیر بکەنەوە لەو هەمو نیعمەتە زۆرو جۆراو جۆرانەی پەروەردگار.

(١٤) جا خوا ئەو زاتەیە کەوا دەریای بۆ ئێوە رامو گەردنکەچ کردووەو هێزێکی وای پێداوە کە ئەو هەمو شتە قورسانە هەڵدەگەرێتو بەئاسانی هاتو چۆی تێدا دەکرێت، وە جۆرەها ماسی تێدایە تا ئێوە لەو دەریایانەدا گۆشتی ناسکی ماسی بخۆن بەڵێ گۆشتی ماسی تەنها گیانلەبەرێکی حەڵاڵە کە هەتا بمێنێ وگەورە ببێ هەرگۆشتەکەی تەرچكو ناسکەو خواردنی بەلەزەت

وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ﴿٢٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمۡ قَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحۡمِلُوٓاْ أَوۡزَارَهُمۡ كَامِلَةٗ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَمِنۡ أَوۡزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيۡرِ عِلۡمٍۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدۡ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنۡيَٰنَهُم مِّنَ ٱلۡقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيۡهِمُ ٱلسَّقۡفُ مِن فَوۡقِهِمۡ وَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٢٦﴾

تره، واته: به پیر بوونی ماسی گۆشتەكەی لە ناسكیو بەتامی دەرناچێت وە تا ئێوە لەو دەریایانەدا مورویی بەنرخ بۆ خۆ جوان كردن دەربهێنن وەك دوڕو یاقوتو شتانی تر كە دەیكەن بە پۆشاك بۆ خۆتان بەتایبەت بۆئافرەتان كە نیوەی مرۆڤە ئەگەر چی هیچ مادەیەكی دەریایی لە پیاو قەدەغە نەكراوە وە تۆ دەبینی كەكەشتیەكان چۆن ئەو ئاوە شەق دەكەنو هاتو چۆی تێدا دەكەن جا خوا ئەوانەتان بۆ دەكات تا ئێوەش بتوانن بگەڕێن بەسەر دەریاداو لە رۆزیو زیادەی ﷲ سود وەرگرن، وە بۆ ئەوەی كە ئێوەش رێزی نیعمەتەكانی خودا بگرنو سوپاسی بكەن،

﴿١٥﴾ ئەوسا خوا چیا بەهێزو بتەو جێگیرەكانی هاویشتوەتە سەر زەویو دایكوتاوە بەناویدا تا ببێ بەهۆی راگرتنی زەویو درێژەدان بەژیانی ئێوە لەم زەوییەدا، وە چەندین جۆگاو روباری لەو زەوییەدا داناوە بۆ ئاسانكردنی ژیان لەم گردە خاكەداو چەندین رێگای داناوە تا ئێوە رێگای هاتو چۆی خۆتان بدۆزنەوەو بتوانن بە ئاسانی لە نێوان ئەو چیا گەورەو سەركەشانەدا هاتوچۆ بكەن.

﴿١٦﴾ ئەوسا ئەوان بەهۆی چەندین بەڵگەو نیشانەی دیاریو ئەستێرەكانەوە دەتوانن رێگا بدوزنەوە بەتایبەت لە دەشتاییەكاندا بەشەوو لەناو دەریا پانو پۆڕەكاندا ئەستێرەكان دەورێكی كاریگەرو گرنگیان هەیە بۆ دۆزینەوەی رێگا. ئینجا خوای داناو باڵا دەست كوتو پڕ روو دەكاتە بت پەرستانو رایان دەچڵەكێنێو دەفەرموێ:

﴿١٧﴾ ئایا ئەو كەسەی كە دروست دەكات وەك ئەو كەسە وایە كە هیچ دروست ناكات؟ واتە ئایا ئەو خوایەی كەخالقی هەمو شتێكە وەك ئەو بتانەیە كە ئێوە دەیان پەرستن كە ناتوانن هیچ شتێك دروست بكەن؟ ئایا بیر ناكەنەوە ونازانن كە چەندە نەفامن؟

﴿١٨﴾ خۆ ئەگەر نیعمەتەكانی خوا بژمێرن بۆتان نا ژمێررێت، واتە: نیعمەتەكانی خودا ئەوەندە زۆرە نەك ناتوانن بەتەواوی سوپاسی بكەن بەڵكو ناتوانن بەتەواوی نیعمەتەكانیشی بژمێررن، ئەگەر مرۆڤ بەگوێرەی توانای خۆی سوپاسی خوا بكات بەراستی خوا خوایەكی لێخۆشبو بەسۆزە بۆ بەندەكانیو چاو پۆشی لێ دەكاتو سزایان نادات.

﴿١٩﴾ ئەوسا خوا دەزانێ بەوەی كەئێوە دەی شارنەوەو ئەوەی كە ئاشكرای دەكەن، واتە: لە لای ﷲ پەنهانو ئاشكرا وەك یەك وایەو هیچی لێ ون نابێو هیچی لێ پەنا نادرێت، چونكە هەر خۆیەتی كە پەنهانیو ئاشكرا دروست دەكات، جا دەگونجێ شتێ خۆی دروستی بكاتو پێی نەزانێ؟! جا ﷲ ئەو هەمو نیعمەتانەی پێداونو لە هەمو شتیشتان ئاگادارە .

﴿٢٠﴾ جا ئەوانەی كە ئەوان جگە لە ﷲ دەیان پەرستن هیچ شتێك دروست ناكەن بەڵكو خۆیشیان دروستكراون ئەمە هەمو بتەكان دەگەڕێتەوە چ گڵیان لەبەربن چ بێ گڵیان هەمویان دروستكراون وهیچیان پێ دروست ناكرێت،

﴿٢١﴾ خۆزۆر بەیشیان مردونو زیندو نین ونازانن‌و هەست ناكەن كە كەی زیندو دەكرێنەوە، جا چۆن چاوەڕوانی چاكەو پاداشتیان لێدەكەن؟

﴿٢٢﴾ خوای ئێوە خوایەكی تەنیایەو هاوبەش ویاریدە دەرو هاوكاری نیەو نیازی بەكەس نیەو هەمو دروستكراوەكان نیازیان بەوەهەیە، بەڵام ئەوانەی كە باوەڕیان بەرۆژی دوای نییە دڵیان نكولی ئەو حەقیقەتو راستیە دەكات وئەوان خۆیان بەگەورە دەزاننو بەندایەتی بۆ ﷲ ناكەن.

﴿٢٣﴾ شتێكی راست ورەوایە كە بە دڵنیاییەوە خوا دەزانێ بە هەر شتێ كە دەیشارنەوەو ئەوەی كە ئاشكرای دەكەن، بەراستی ﷲ مرۆڤی خۆبەزل زانو موتوكەبیری خۆش ناوێت، واتە: ئەوانەی كە بێ باوەڕن بە خوای زاناو باڵادەست لەبەر ئەوەیە كە ئەوندە خۆ بە گەورە دەزانن كە پەیرەوی پێغەمبەرو پیاوچاكانیان بەلاوە كەمیو نزمیە، بۆیە گوێ بە ئایینو پێغەمبەران نادەن، جا بەو هۆیەوە خواش ئەوانی خۆش ناوێو یارمەتیان نادات‌و لە

پاشە ڕۆژدا بە ئاگری دۆزەخ تۆڵەیان لێ دەکاتەوە، چونکە ئەم بێباوەڕو بت پەرستو تاوانبارانە هیچ نرخێك بۆ قورئان دانانێن،

﴿٢٤﴾ خۆ هەر کاتێ پێیان وترا بێت پەروەردگارتان چی بۆ ڕەوانەکردون دەڵێن: ئەوە چیرۆكو داستانی پڕو پوچی پێشوانە تا بەم شێوەیە سەر لە خەڵك بشێوێننو لە پەیڕەوی کردنی قورئان دوریان بخەنەوە.

﴿٢٥﴾ جا بەهۆی ئەم هەڵوێستە ناپەسەندو ناشرینانەیانەوە لە ڕۆژی قیامەت دا با باری تاوانی خۆیان بە تەواوی هەڵگرن، هەروەها بەشێك لە تاوانو گوناهی ئەو کەسانەش کە بە بێ ئەوەی کە ئاگایان لە خۆیان بێ، ئەوان گومڕایان دەکەن وڕێگای ڕاستیان لێ دەگۆڕن، ئاگادار بن کە بەڕاستی ئەوانە بار یێکی زۆر قورسی تاوانو خراپەیان هەڵگرتوە، واتە: تاوانی خۆیو تاوانی گومڕا کردنیشی لەسەرە، کەوابو ئەمە دژی ئەو ئایەتە نییە کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ﴿١٥﴾ /ئیسرا. واتە: هیچ نەفسێکی گوناهبار گوناهی کەسێکی تر هەڵناگرێت﴾ چونکە لێرەش باری خۆی هەڵگرتوە کە هۆی گومراکردنیان بوە، بەبێ ئەوەی لە تاوانی پەیڕەوی کەری بێئاگای هیچ کەم بکاتەوە. وەك پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ: { مَنْ دَعَا إلى هُدًى كَانَ لَهُ مِنْ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا وَمَنْ دَعَا إلى ضَلَالَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنْ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا./مسلم وغ ه/ هەر کەس بانگ بکات بۆ چاکەیەك ئەو کەسە بە ئەندازەی پاداشتەکانی ئەوەی کە دوای دەکەوێت بۆ هەیە بە بێ ئەوە کە لە پاداشتیان کەم بکرێتەوەو هەرکەسێکیش خەڵك بۆ گومڕاهییەك بانگ بکات ئەوە بە ئەندازەی تاوانو گوناهەکانی ئەوەی کە دوای کەوتوە بۆی هەیە بە بێ ئەوەی لە تاوانی هیچ لایەك کەم بکرێتەوە}.

ئینجا ﷲ دڵنەوای پێغەمبەرمانﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٢٦﴾ بەحەقیقەت ئەی محمدﷺئەوانەی پێش ئەم گەلەی تۆ بۆ دژایەتی کردنی پێغەمبەران فڕوفێڵی زۆریان کرد کە ئەوندە فڕوفێڵیان لەسەر یەك کۆ کردبویەوە کە وەك بینایەکی گەورە وابوو، جا ﷲ هەر لە بناغەوە ئەو بینا فڕوفێڵەی لەناو بردنو هەموی بە سەر خۆیاندا شکاندەوە، جا بوون بە عەزابێك بۆ خۆیان، وەلە لایەکەوە سزایان بۆ هات کە خۆیان هیچ هەستیان پێ نەکرد تایەخەی گرتنو وایان دەزانی کە ئەو هەمو فڕوفێڵە سودیان پێ دەگەیەنێت بەڵام بو بە هۆی سزایان. یان مەبەست ئەوەیە گەلانی پێشو کە دژایەتی پێغەمبەرەکانیان دەکرد ﷲ

ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَٰٓقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾ ۞ وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا۟ خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِى ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٤﴾

دیواری بیناکانیانی لە بنەوە هەڵکەندنو ئەوسا سەربانەکانیانی بەسەردا تەپاندن، وە لە لایەکەوە سزایان بۆهات کەخۆیان هیچ هەستیان پێ نەکرد، واتە: با ئەم گەلەی تۆش بترسن لە سزای کوتو پڕی ﷲ.

﴿٢٧﴾ جا نەك هەر لە دنیا ئاوایان لێ دەکەین بەڵکو پاشان لە ڕۆژی قیامەتیشدا خوا سەر شۆڕیان دەکات، وە دەفەرموێ: کوا ئەو هاوبەش وشەریکانەی کە ئێوە بە هۆی ئەوانەوە دژایەتی پێغەمبەرو پەیڕەوانی ڕاستەقینەی ئیسلامتان پێ دەکرد با ئەمڕۆ بێنو یارمەتیتان بدەنو لەم سزایە ڕزگارتان بکەن؟ جا لەو کاتەدا ئەوانەی عیلمیان پێدراوەو زانیاریان هەیە دەڵێن: بەڕاستی سەرشۆڕی ئەمڕۆو سزای خراپ بەشی کافرانەو هیچ کەسێکیش ناتوانێ پاڵ پشتو یارمەتی دەریان بێ‌و لە سەرشۆڕیو سزاو خراپە ڕزگاریان بکات. جا ئەوەش گەورییەکە بۆئەهلی عیلم کە ﷲ بۆ قسەکانیان نرخ دادەنێت، چونکە هەر چۆن لە دنیا حەق وێژ بوون وا لێرەش هەر حەق وێژن. پاشان ﷲ باسی کاتی گیان کێشانی ئەو بێ باوەڕانمانە بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٢٨﴾ ئەوانەی کە فریشتەکانی گیانکێشان گیانیان دەکێشن لەحاڵێکدا کە لە دنیادا بە ئەنجامدانی کوفرو شیرك ستەمیان لە خۆیان کرد بوو ئەو کاتە خۆیان تەسلیم دەکەنو ئامادەی

وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ لَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖ نَّحۡنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمۡنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيۡءٖۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ فَهَلۡ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنۡهُم مَّنۡ حَقَّتۡ عَلَيۡهِ ٱلضَّلَٰلَةُۚ فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحۡرِصۡ عَلَىٰ هُدَىٰهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَن يُضِلُّۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَا يَبۡعَثُ ٱللَّهُ مَن يَمُوتُۚ بَلَىٰ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِي يَخۡتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ كَانُواْ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوۡلُنَا لِشَيۡءٍ إِذَآ أَرَدۡنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْ لَنُبَوِّئَنَّهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَلَأَجۡرُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾

بەندایەتیو گوێ رایەڵی دەبن و دەڵێن: ئێمە هیچ ئیشی خراپمان نەکردوە، واتە: لەو کاتەدا خۆیان بە پیاو چاك پیشان دەدەنو حاشا لە ئیشە خراپەکانیان دەکەنو وا دەزانن خوا بێ ئاگایە لێیان، جا بە دەمیاندا دەدرێتەوە کە نەخێر وانییە کە ئێوە بیر دەکەنەوە خوا زۆر زانەرە بەوەی کە کردوتانە وهیچی لێ ون نەبوە، ئینجا پێیان دەوترێت:

﴿٢٩﴾ ئادەی لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ناو دۆزەخەوە کە ئەوە جێگاتانە بۆ هەمیشە، جا بێگومان پیسترین جێگایە، جێگای خۆبەزل زانانو لوت بەرزانو بێ باوەڕان. پاشان ﷲ باس لە هەڵوێستی لە خوا ترسان بەرامبەر بە قورئان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٣٠﴾ بێژرا بە ئیمانداران خوای ئێوە چی رەوانە کردوە؟ وتیان: خێرو بەرەکەتی رەوانەکردوە، بۆ ئەو کەسانەی کە چاکەیان کردوە لە دنیادا چاکەیان لە گەڵ دا دەکرێتو ژیانی پاکیان پێدەدرێتو بەراستی ماڵی دوا رۆژیان کە بەهەشتە چاکترە لە دنیاو هەمو شتەکانیو بەراستی باشترین جێگایە خانوی پارێزکارانو لە خوا ترسان کە بریتیە لە:

﴿٣١﴾ بەهەشتانێکە کە جێگەی دانیشتنو مانەوەیە کە ئەو لە خوا ترسانە دەچنە ناویەوەو هەرچی لەوێدا ئارەزۆ بکەن بۆیان هەیە هەر ئاوەها ﷲ پاداشتی پارێزکاران دەداتەوە. ئینجا

هەرچۆن لە پێشەوە باسی سەرەمەرگی بێباوەڕانی کرد لێرەش باس لە کاتی گیانکێشانی باوەڕداران دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٣٢﴾ ئەوانەی کە فریشتەکان لە کاتی گیانکێشانیاندا گیانیان دەکێشێ لەحاڵێکداکە ئەوان پاكو خاوێن بوون لە تاوانو کوفرو بت پەرستی پێیان دەڵێن: سەلامتان لێ بێت، بچنە ناو بەهەشتەوە بەهۆی ئەو کردارە باشانەی کە کردوتانن لەدنیادا. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

﴿٣٣﴾ ئایا ئەم بێباوەڕانە چاوەڕێی چی دەکەن کە هەر ئاوا بەردەوامن لە سەر کوفرو بێ دینی جگە لەوەی کەوا رۆژێك لە رۆژان فریشتەکان بێن بۆ گیان کێشانیان یان فەرمانی پەروەردگارت بێ بۆ لەناوچونیان یان قیامەت بێت بەسەریاندا، واتە: جگە لەوە چاوەڕێی چی دەکەن؟ پەروەردگارت هەر ئاوەهای کردوە بەو کەسانەی کە لە پێش ئەو گەلەی تۆدا بوون، وەخواش رەوشتی خۆی ناگۆڕێ خۆ خوا ستەمی لێ نەکردون کە ئاوەهای بەسەر هێناون بەڵکو خۆیان ستەمیان لە نەفسی خۆیان کردوە کە بە تاوانو کوفرو بت پەرستیەوە خەریك بوون، جا ئەگەر ئەم گەلەی تۆ ژیر بنو بەزەییان بێتەوە بەخۆیاندا هەرچی زوترە پەشیمان دەبنەوە لە کوفرو تاوانو بت پەرستیو رو دەکەنە پەروەردگایانو نامەی کردارەکانیان سپی دەکەنەوە، ئەگینا بەشیان جگە لە ناوچونو سزا شتێکی تر نییە.

﴿٣٤﴾ ئەوسا سزای ئەو رفتارە ناشرینەیان توشیان بوو گیروەدەی کردنو ئەو سزاو عەزابەی کە گاڵتەیان پێدەکرد دای بە سەریاندا. پاشان پەروەردگار باس لەوە دەکات کە چۆن موشریکەکان بۆ ئەو تاوانە گەورەی کە دەیکەن بەڵگە دەهێننەوە دەفەرموێ:

﴿٣٥﴾ جا ئەو کەسانەی هاوبەشیان بۆ خوا دانابو وتیان: ئەگەر خوا ئارەزۆی لێبوایە ئێمە جگە لەو هیچ شتێکی ترمان نەدەپەرست نەخۆمانو نە باو باپیرانمانو هیچ شتێکیشمان بە بێ بڕیاری ئەو قەدەغە نە دەکرد، ئەوانەی کە لە پێش ئەم گەلەی تۆدا بوون هەروایان دەکردو هەروایشیان دەوت، واتە مشریکان دەڵێن: مادام کە خوا ماوەمان پێدەداتو سزامان نادات ئەوە دەگەیەنێت کە خوا بەم ئیشەی ئێمە رازیەو وای پێ خۆشە، ئینجا خوا دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ؟ ئایا پێغەمبەران جگە لە گەیاندنی ئاشکراو ڕون شتێکی تریان لەسەر پێویستە؟ واتە: خوا زۆر لەکەس ناکاتو پێغەمبەرانی نەناردوە کە کەس بەزۆر بکەن بەباوەڕدار ئەوان گەیاندنی ئاشکرایان لەسەرە، جا ئێوەیشن کە بە ئارەزۆی خۆتان رێی خۆتان هەڵدەبژێرن .

(٣٦) جا بەراستی ئێمە بۆ هەمو گەلێك پێغەمبەرێكمان ناردوە كە بەو گەلەی خۆیان بڵێن: تەنها(اللَّهُ) بپەرستن‌و دوور بكەونەوە لە هەمو تاغوتەكان، جا هەندێك لەوانە رێگەی هیدایەتی گرتووەو خوداش هیدایەتی داوەو هەندێكی تریشیان بە هۆی لاساری خۆیانەوە گومڕاهی‌و سەر لێشێواوی بوەتە شتێكی پێویست‌و چەسپاو پێیانەوەو وازیان لێ نەهێناوە، ئینجا خوا دەفەرموێ: دەی با بە ژیرانە بگەڕێن بەسەر زەویداو شوێنەوارەكان ببینن، ئینجا تەماشا بكەن‌و بزانن ئەوكەسانەی كە بێباوەڕبون چییان بەسەر هاتوە؟ وە بزانن كە سەرنویشتی ئەوانیش هەروا دەبێت. پەیڕەوی هەر شتێك بكرێت جگە لە (اللَّهُ) مادام ئەو پەیڕەوی كردنە لە سنوری ئاییندا نەبێ ئەو پەیڕەوی كردنە كوفرو شیركەو پەیڕەوی كراویش ئەگەر خۆی بەوە رازی بێت تاغوتە.

(٣٧) ئەی محمدﷺ ئەگەر تۆ هەر چەند سور بیت لەسەر هیدایەت‌و خۆشبەختكردنیان سا بێگومانبە كە اللَّهُ ئەو كەسەی كە گومڕاهی كردوە رێنمایی‌و خۆشبەختی ناكات، چونكە خۆی نیەتی خراپەو رێنمای ناوێت، جا تۆش ناتوانی هیدایەتی بدەیت‌و بۆ ئەوان هیچ یارمەتی دەرێك نیە كە یارمەتیان بدات‌و بیانخاتە سەر رێگای خۆشبەختی.

(٣٨) خۆ ئەوان بەهەمو هێزی خۆیان سوێند بە خوا ئەخۆن‌و دەڵێن: هەرگیز خوا ئەوانەی كە مردوون زیندویان ناكاتەوە، خواش دەفەرموێ: نەخێر وانییە كە ئەوان دەڵێن زیندو كردنەوەی مرۆڤ بۆ حیساب بڕیارێكی بڕاوەی (اللَّهُ) یەو دێتەدی بەڵام زۆربەی خەڵك ئەو راستیە نازانن‌و لێی تێناگەن‌و دژایەتی ئەكەن، جا خوا هەندێ لە سودەكانی زیندو كردنەوە باس دەكات‌و دەفەرموێ:

(٣٩) زیندویان ئەكەینەوەو حیسابیان لەگەڵدا دەكەین تا رۆشن بكەینەوە بۆیان ئەو زیندو كردنەوەی كە ئەوان ناكۆكیان تێیدا بوو، تابزانن بەراستی ئەوان درۆزن بوون‌و لە خۆیانەوەبەبێ بەڵگە باوەڕیان بەزیندو كردنەوە نەبوە. ئینجا خوا باسی چۆنێتی ئەنجامدانی بڕیارەكانی خۆی دەكات‌و دەفەرموێ:

(٤٠) قسەی ئێمە بۆ هەر شتێك كە بمانەوێ بیكەین هەر ئەوەندەیە كە بڵێین: ببە، كوت‌و پڕ دەبێ‌و هیچ شتێك ناتوانێت رێگای بگرێت، واتە: ئەوەی بەلای ئێوەوە دورەو نەگونجاوە لای ئێمە زۆر ئاسانەو تەنها فەرمان پێكردنی ئەوێ‌و هیچی تر. ئینجا خوای میهرەبان كۆچكەرانی رێگای خۆی‌و پاداشەكانیان بە شێوەیەكی كورت باس دەكات‌و دەفەرموێ:

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفٖ فَإِنَّ رَبَّكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٖ يَتَفَيَّؤُاْ ظِلَٰلُهُۥ عَنِ ٱلۡيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدٗا لِّلَّهِ وَهُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ۩ ﴿٥٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾

(٤١) ئەوسا ئەو كەسانەی كە ماڵ‌و وڵات‌و خێزانی خۆیانیان بەجێهێشتوە لەبەر خاتری رەزامەندی خوا پاش ئەوەی كەستەمیان لێكرا هەر لە دنیادا شوێن‌و جێگای چاكیان پێ ئەدەین. هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە كۆچكردنی ئەو موسڵمانانە بو كە چون بۆ حەبەشەو بڕیارەكە گشتیەو بۆ هەر موسڵمانێك لە هەر كات‌و جێگایەكدابێ، سوپاس بۆ خوا بەدرێژای مێژوی ئیسلام ئەم بڕیارەی خوا چەسپاوو رۆشن‌و نەگۆڕاو بووە سەبارەت بەو كەسانەی كەبە راستی وازیان لە وڵات‌و خزم‌و كەس‌و كارو منداڵی خۆیان هێناوەو خوای میهرەبان چاكەی بێ سنوری لەگەڵدا كردون لە دنیاداو بێگومان كە پاداشتی رۆژی قیامەت زۆر گەورەترە ئەگەر ئەوان بزانن، واتە سەرەرای ئەو هەمو چاكەی كە اللَّهُ لە گەڵیاندا دەكات پاداشتی قیامەتیان زۆر زیاترو گەورەترە،

(٤٢) ئەو پاداشە گەورە بۆ ئەو كۆچكەرانەی كە لەبەرامبەر بەڵاو موسیبەتی ئاوارەیی‌و بێ كەس‌وكاری‌و بێ جێگاورێگایی خۆیان گرتوەو نا شوكری خودای خۆیان نەكردوە لە سەر ئەوەی كە توشیان بووە، وە تەنها بە پەروەردگاری خۆیان پشتیان بەستوە نەبە ئەم‌و ئەو.

جارێکی تر خوا دڵخۆشی پێغەمبەرمانﷺ دەکات‌و لەدەم ئەو بێباوەڕانە دەدات کە ئەیان وت: خوا گەورەترە لەوەی کە بەشەرێك بکات بە پێغەمبەری خۆی‌و دەفەرموێ:

(٤٣) خۆ ئێمە ڕەوانەمان نەکردوە لە پێش تۆدا مەگەر پیاوان کە وەحیمان کردوەتە لایان، واتە: هەر پیاوو بەشەرمان لە پێش تۆدا ناردوە، بۆچی ئێستا بە تۆ وا دەڵێن، جا ئەوانەی کە گومانیان لەم بارەوە هەیە با پرسیار بکەن لەوانەی کە زانیاری پەڕاوەکانی پێشویان هەیە ئەگەر ئێوە ئەم ڕاستیە نازانن،

(٤٤) تابەبەڵگەی ڕۆشن‌و بەو پەڕاوەی پێشو ئەو ڕاستیەتان بۆ ڕۆشن بکەنەوە، وە ئێمە قورئانمان ڕەوانە کردوەتە لای تۆ ئەی محمدﷺتا تۆیش مانای ئەوەی کە ڕەوانە کراوەتە لایان ڕۆشن بکەیتەوە بۆیان بەڵکو ئەوانیش بیر بکەنەوە، واتە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ئەرکی ڕۆشن کردنەوەی قورئانی پێسپێرراوەو فەرمودەکانی مانای قورئانەو ئەبێ پەیڕەوی بکرێت، ئەمە دەم کوتێکە بۆ ئەوانەی کە ئیسلام ناناسن‌و لەبەر تەمەڵی ئاگایان لە فەرمودەکانی پێغەمبەر نییەو دەڵێن: قورئان بەسە. بەڵێ ڕاستە قورئان بەسە بەومەرجەی وەك خۆی چۆن ڕێنمایمان دەکات ئاوا پەیڕەوی بکەین، ئەوەتە قورئان خۆی ئەڵێت: پێغەمبەرﷺڕۆشن کەرەوەمە جا ئەگەر ڕاست ئەکەن خۆ ئەوە ئایەتی ئەو قورئانەیەو پێویستە بەگوێ بکەن هەروەك چۆن لە چەندین ئایەتی تردا ئەم شتەی ڕۆشنکردوەتەوە لەوانە ئایەتی ﴿ قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾ آل عمران: ٣١. وە ئایەتی ﴿ مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا ﴾ النساء: ٨٠. ﴿ ٱلذِّكۡرَ ﴾ ناوێکی قورئانە چونکە یادی خوای تێدا هاتوەو بیر خەرەوەیەو بۆ هەمو پەڕاوەکانی تریش بە کارئەهێنرێت. جا خوای زاناو توانا هەڕەشە دەکات لەو کەسانەی کە بێباوەڕن‌و تاوان دەکەن‌و دەفەرموێ:

(٤٥) ئایا ئەوانەی کە فرووفێڵی خراپ دەکەن‌و ئەیانەوێ ئیسلام ناشیرین بکەن ناترسن لەوەی کە خوا بیان بات بەناخی زەویدا؟ یان ئەو سزا گەورەیەی کە بۆیان دانراوە لە جێگایەکەوە بۆیان بێت کە ئەوان هیچ هەستی پێ نەکەن؟

(٤٦) یان لە کاتی هاتو چۆو گەشت‌و گەڕاندا خوا تۆڵەیان لێ وەرگرێت؟ ئەوسا ئەوان ناتوانن ڕێگای ﷲ بگرن لە هەر بەڵایەك کە ئارەزۆ لێ بێت‌و بەسەریاندا بهێنێ.

(٤٧) یان ﷲ تۆڵەیان لێ وەرگرێت لە حاڵەتێکدا کە چاویان لە هاتنی ئەو سزایەیەو ئەترسن وەك ئەوەی کە کەس‌و کارو هێزو دەسەڵاتیان کەم کەم لەناو ببات‌و نەتوانن هیچ بەرگریەکیش لەو کەم کردنەوە بکەن‌و دوژمنانیان بەسەردا زاڵ بکات‌و بەچاوی خۆیان مەرگی خۆیان پێش هاتنی ببینن، واتە: بۆچی ئەوەندە گەمژەو نەزانن بیر لە پاشە ڕۆژی خۆتان ناکەنەوە پێش ئەوەی کار لەکار بترازێت بۆ بەرەو پەروەردگارتان ناگەڕێنەوە؟ بەڕاستی پەروەردگارتان زۆر میهرەبان‌و زۆر بەرەحمە بۆتان. بەڵێ ئەگەر سۆزو میهرەبانی نەبێ بۆتان خۆ ئەو لەکەس ناترسێت ولەکۆتاییدا هەمو کەسێکیش ئەچێتەوە بەردەستی، دەی بۆ ئەو پێغەمبەرو پەڕاوەی ناردوەو ئەو هەمو ئامۆژگاریەی دەکات؟

(٤٨) ئایا باوەڕیان بەهێزی خوانیەو نابینن ئەوانەی کە خوا دروستیکردوون چۆن سێبەرەکانیان بەلای ڕاست‌و چەپدا ئەسوڕێتەوە کە بەڵگەی گەردنکەچی‌و ڕام بونیەتی بۆ فەرمانەکانی خوای تواناو زانا وەك دەفەرموێ، خۆ ئەوان گوێڕایەڵ‌و گەردنکەچن بۆ خواو ناتوانن لەو یاسایە دەربچن کە خوا بۆی داناون، ئینجا نەك هەر سێبەرەکانیان گەردنکەچە بەڵکو هەمو دروستکراوەکان بەبێ جیاوازی ملکەچی یاسای پەروەردگاری عالەمن وەك دەفەرموێ:

(٤٩) جا بۆ خوا ڕام وگەردنکەچ ئەبێ ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەوی دایە چ ئەوەی کە دەجوڵێت چ فریشتەکان خۆ ئەوان هەرگیز خۆیان بەگەورە ناگرن‌و سوجدە بۆ خوا ئەبەن‌و فەرمانەکانی جێ بەجێ ئەکەن بە تایبەت فریشتەکان هیچ کات لە فەرمانی خوا لا نادەن‌و تەواوی گیانلەبەرانی تریش جگە لەو سەر پشکییەی کە بە مرۆڤ‌و جنۆکەدراوە ڕام‌و ملکەچن بۆ ئەو بەرنامەی کە خوا بۆی داناون

(٥٠) کە ئەو فریشتانەیش دەترسن لەو پەروەردگارەیان کەلە سەریانەوەیەو ئەوان لەژێر دەستی ئەودان‌و هەر فەرمانێکیان بەسەردا بدات ئەوان بێ سێ‌و دوو ئەنجامی دەدەن.

(٥١) جا ﷲ فەرمویەتی: هەرگیز دوو خودا بۆ خۆتان دانەنێن چونکە ئەو تەنها یەك خودایە، جا تەنها لەمن بترسن لەکەسی تر مەترسن، چونکە بەبێ فەرمانی من هیچ کەس هیچ شتێکی پێ ناکرێت.

(٥٢) خۆ هەر موڵکی خودایە ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەویدا هەیە، ئیتر ئێوە چۆن موڵکی خۆی ئەکەن بەشەریکی ئەو زاتەو لە جیاتی ئەودا بەندایەتی بۆ ئەکەن؟ ئەمە چ عەقڵێکە؟

بەرنامەی پێویستو فەرزکراو لەسەر مرۆڤ تەنها بەرنامەی (اللَّهُ)یەو نابێ بەرنامەی کەسێ تر بە پێویست بزانرێتو پەیڕەوی بکرێت، چونکە ئەو پەیڕەوی کردنە پەرستنەو خوا تورەیە لەو کردارەو دەفەرموێ: ئایا ئێوە جگە لە (اللَّهُ) لەکەسانێکی تر ئەترسن و پەیڕەوییان دەکەن؟ واتە شتی وانەکەن، ئینجا چاکتر رونی دەکاتەوەو تێمان دەگەیەنێ کە جگە لە خوا هیچیان لەدەست نایەتو دەفەرموێ:

(٥٣) خۆ هەرچی نیعمەتێك کە ئێوە هەتانەو مایەی بەختەوەری ژیانتانەو سودی لێ وەردەگرن لە خواوەیە بەڵام ئێوە رێزی ناگرنو سوپاسی خوا ناکەنو کەسانی تر ئەکەن بەهاوبەش، لە پاشان هەر کاتێك ئێوە دوچاری تەنگانەو ناخۆشی ببن تەنها بۆ لای ئەو پەنا ئەبەنو هاوار لەو دەکەن،

(٥٤) لەپاشان هەر کاتێك ئەو تەنگانەیە لە سەر ئێوە لا ببات کوتو پڕ کۆمەڵێك لە ئێوە هاوڵ بۆ خوا دادەنێن،

(٥٥) بۆیە ئەم هاوبەشیە دادەنێن تاکو بێباوەڕبن بەوەی کە ئێمە پێمان داوون، ئەوسا با رابوێرن بەم زوانە دەزانن چیتان بەسەردێت لەسەر ئەو سەرپێچیو نافەرمانیەی کە بەرامبەر بە ئێمە دەیکەن.

(٥٦) جا ئەو نەزانانە هەندێ لەو سەروەتو سامانو ئاژەڵەی کە پێمان داوون دایئەنێن بۆ ئەو بتانەی کە خۆیان هیچ شتێك نازانن، جا خوا هەڕەشەیان لێ دەکاتو دەفەرموێ: دڵنیا بن کە پرسیارتان لێ دەکرێت لەو درۆو هەڵبەسراوانەی کە بۆ (اللَّهُ)ی دا دەنێنو نیعمەتەکانی ئەو بۆ ئەو بتانە خەرج ئەکەنو بەندایەتیان بۆ ئەکەن.

(٥٧) جا بۆ خوا کچان دا دەنێن، پاكو بێ نیازە خوا لەو قسە پوچانە لە حاڵێکا ئەوان ئەیانەوێ چییان پێخۆشە ئەوەیان هەبێ، واتە: ئەوان کوڕیان بەلاوە چاکە بۆ خۆیان ئەوە هەڵ دەبژێرنو کچیان بەلاوە چاك نیە بۆ خوای دادەنێنو دەڵێن: فریشتەکان کچی خودان! دەی ئەمە چ جۆرە عەقڵێکە خۆی کچی پێ چاك نەبێ وبڵێیت بۆخوا کچ چاکە؟!

(٥٨) جا هەر کاتێ موژدە بدرێت بە یەکێك لەوانو بڵێن:کە خێزانەکەی کچی بووە دەمو چاوی لە خەفەتا رەش ئەبێو زۆر نارەحەت ئەبێو دڵی لە لەداخو خەفەتدا خەریك شەق ببات.

(٥٩) کە خۆی ئەشارێتەوە لەو خەڵکەی کە زانیویانە کچی بوە لەبەر خراپی ئەو مژدەیەی کە پێی دراوەو نازانێ لەداخا چی

لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ (٥٥) وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَٰهُمْ ۗ تَٱللَّهِ لَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ (٥٦) وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ ٱلْبَنَٰتِ سُبْحَٰنَهُۥ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ (٥٧) وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِٱلْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ (٥٨) يَتَوَٰرَىٰ مِنَ ٱلْقَوْمِ مِن سُوٓءِ مَا بُشِّرَ بِهِۦٓ ۚ أَيُمْسِكُهُۥ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُۥ فِى ٱلتُّرَابِ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ (٥٩) لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ مَثَلُ ٱلسَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ (٦٠) وَلَوْ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلْمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيْهَا مِن دَآبَّةٍ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَـْٔخِرُونَ سَاعَةً ۖ وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ (٦١) وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكْرَهُونَ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمُ ٱلْكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلْحُسْنَىٰ ۖ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفْرَطُونَ (٦٢) تَٱللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٍ مِّن قَبْلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٦٣) وَمَآ أَنزَلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۙ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ (٦٤)

بکات ئایا وازی لێ بێنێو لە ناوی نەباتو بەو شەرمەزارییەوە بمێنێتەوە یان زیندە بەچاڵی بکاتو یەکجاری رزگاری بێ لەو شورەیو خراپە کە توشی بوە! ئینجا ئا ئەم جۆرە کەسانە ئەیان وت: خوا کچی هەیە کەچی سەبارەت بەکچی خۆیان ئاوا رەفتاریان دەکردو خواش دەفەرموێ ئاگاداربە ئەوانە بریارێکی خراپ دەدەن کە بەو شێوەیە مامەڵە لەگەل منداڵی خۆیاندا دەکەنو ئەو جۆرە دابەش کردنەش لەنێوان خۆیانو(اللَّهُ)دا دەکەن، کچان بۆ (اللَّهُ) دائەنێنو کوڕان بۆ خۆیان؟!

(٦٠) بۆ ئەو کەسانەی کە ئیمانیان نییە بە رۆژی دوای وێنەیەکی خراپیان هەیە وهەر بۆ (اللَّهُ)یە وێنەی بەرزو بەرێزتر بەڵام بێباوەڕان وێنەی نزم بۆ خوا دائەنێنو وێنەی بەرز بۆ خۆیان بەڕاستی زۆر بەهەڵەدا چوون، چونکە هەر خوایە کە خوایەکی بەدەسەڵاتەو دانایە لە هەمو ئیشەکانیدا. بەڵێ بێباوەڕان هەمو هەڵس وکەوتو وتاریان هەموی ناڕەواو تاوانە بەڵام خوا خوایەکی میهرەبانو بەرەحمەو پەلە ناکات لە تۆڵە سەندنەوەدا بەڵکو بیر بکەنەوەو تەوبە بکەن، وەك لێرەدا دەفەرموێ:

(٦١) جا ئەگەر (اللَّهُ) لەخەڵکی بەهۆی ستەمەکانیانەوە تۆڵەی وەرگرتایە هیچ شتێکی لەم سەر زەویەدا نەئەهێشتو بەبۆنەی لاساری مرۆڤەوە لەناوی ئەبردن بەڵام (اللَّهُ) دوایان ئەخات هەتا

وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِى ٱلْأَنْعَٰمِ لَعِبْرَةً ۖ نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِى بُطُونِهِۦ مِنۢ بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَآئِغًا لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ أَنِ ٱتَّخِذِى مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِى مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ فَٱسْلُكِى سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا ۚ يَخْرُجُ مِنۢ بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ فِيهِ شِفَآءٌ لِّلنَّاسِ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ ۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾

کاتێك که ناوبراوەو دیاری کراوە، جا هەر کاتێك ماوەیان هات یەك سەعات نەدوا ئەکەوێت وە نە پێش ئەکەوێت.

﴿٦٢﴾ جا ئەوان دای ئەنێن بۆ خوا ئەوەی که بۆ خۆیان پێیان ناخۆشه، وە بە درۆوەو لە خۆیانەوە بە دەم دەڵێن: بێگومان بەهەشت هەربۆ ئەوانە، ئینجا خوا بەدەمیاندا ئەداو دەفەرموێ: بەحەقیقەتو بێگومان کەبۆ ئەوان ئاگر هەیە، بێگومان ئەوان ئەخرێنە ئاگرەوەو پشتگوێ ئەخرێنو رزگار ناکرێن، ئەمە بەڵێنی (ﷲ)یە، جارێکی تر (ﷲ)بۆ دڵنەوایی پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ:

﴿٦٣﴾ ﷲ سوێند بەخۆی دەخواتو دەفەرموێ: بەراستی ئێمە بۆ گەلانی پێش تۆش پێغەمبەرانمان رەوانە کردوە بەڵام شەیتان کردەوە خراپەکانیانی بۆ جوان کردوونو لە رێگای راست لایداوون .جا شەیتان ئەمرۆش دۆستی ئەم خوانەناسانەی سەردەمی تۆیە وبەرەو رۆژ رەشیو نەگبەتیان دەباتو ئەوان سزایەکی زۆر پڕ ئێشو ژانیان بۆ هەیە.

﴿٦٤﴾ ئێمە رەوانەمان نەکردوەتە سەر تۆ ئەم قورئانە مەگەر بۆ ئەوەی کە تۆ رۆشن بکەیتەوە بۆ ئەوان ئەوەی کە ئەوان ناکۆکیان تێیدا هەیە کە هاتنی قیامەتە، وە هەروەها ئەم پەراوەمان نەناردوە بۆ تۆ کە قورئانە مەگەر بۆ ئەوەی کە رێنمایو رەحمەت بێ بۆ گەلێ کە باوەڕ بە تۆو پەیامەکەت ئەهێنن، چونکە تەنها ئەوان سودی لێ وەرئەگەرن ئەگینا ئەم قورئانە بۆ هەمو کەسێك رێنمایو رەحمەتە بەڵام زۆربەی خەڵك روی تێ ناکات، ئینجا ﷲ درێژە بە باسی نیعمەتەکانی خۆی دەداو دەفەرموێ:

﴿٦٥﴾ خوا ئەو زاتەیە کە ئاو لە ئاسمانەوە رەوانە دەکات، جا بەو ئاوە ئەم زەویەی پاش ئەوەی کە بێ گژو گیاو مردبوو زیندو دەکاتەوە، بەراستی ئا لێرەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ ئەو گەلەی کە گوێ بگرێتو راستی ببیسێت.

﴿٦٦﴾ جابەراستی بۆ ئێوە لە مەڕو ماڵاتدا پەندو ئامۆژگارییەکی گەورە هەیە ئێمە لەوەی کە لە ناو سکی ئەواندایە ئاوتان پێ ئەدەین کە ئەو شیرەیە کە لە نێوان شیاکەو خوێندایە شیرێکی سپیو پاکو خاوێنی جوان کە بەئاسانی قوت ئەدرێتو لە لایەن بخۆرانیەوە هیچ بێزێکی لێ ناکرێت! جا ئەی مرۆڤ بۆ بیر ناکەیتەوە ئەو شیرە سپیەتایبەتە لەناو شیاکەو خوێنداو لەو جێگا تەنگەدا کام دەزگاو کارخانەیەك دەتوانێت ئاوا ئیشێ بکات؟! ئینجا دەفەرموێ:

﴿٦٧﴾ خۆ لە بەروبومی خورماو ترێ کان ئێوە ماددەی سەرخۆشیو رۆزییەکی شیرینو جوان وەرئەگەرن بێگومان لە تەماشاکردنی ئەو هەمو نیعمەتە جۆراو جۆرانەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ ئەو گەلەی کە ژیری خۆی بخاتە کارەوەو چاك بیر بکاتەوە، ئەمە یەکەم ئایەت بو کە هاتە خوارەوەو خراپی ماددەی سەرخۆشکەری لێ وەرئەگیرا چونکە خوا جیایی کردوەتەوە لە رۆزی جوان ﴿ رِزْقًا حَسَنًا ﴾ جا ئەوانەی ئەمەیان وەرگرت هەندێکیان وازیان لە خواردنەوەی شەراب هێناو هەندێکی تری داوای لە خوا کرد کە جوانتر بۆیان رۆشن بکاتەوە تا ئاخر جار ئایەتی (نەوەدو نەوەدو یەکی/ مائیدە)هاتە خوارەوەو ئیتر بە تەواوی وازی لێ هێنرا . ئینجا نیعمەتێکی ترمان بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٦٨﴾ ئەوسا نیگامان کردە لای مێش هەنگوتێمانگەیاندن کە بۆ دروستکردنی هەنگوین هەندێ لە چیاکان بکەن بەماڵ بۆ خۆتان،

﴿٦٩﴾ جا لە هەندێ لەدرختەکانیش و لەوانەی کە خەڵك بۆتان دروست دەکەن وەك سەبەتەو سندوقو شتی تر، لە پاشان پێمان وت:لە هەمو بەرو بومێك بخۆو رێگاکانی پەروەردگاری خۆت بۆ ئەنجامدانی ئیشەکانی خۆت گەردنکەچانە بگرەو ئیشی خۆت بکە کە لەناو سکیەوە خواردنەوەیەکی شیرین کە هەنگوینە دێتە دەرەوە کە رەنگەکانی جیایە لەیەك سورو سپیو ووشكو تەڕو،

یەك دایك بەچكە دەكات كەچی بەچكەكانی جیان لەیەك، نێرو مێو گەورەو بچوك رەشو زەرد وتامی هەنگوینەكەی بەگوێرەی خواردنەكەی ئەگۆرێو لەو هەنگوینەدا شیفا هەیە بۆ خەڵك . بەراستی ئا لەوەدا كە باسكرا بەڵگەیەكی گەورە هەیە بۆ ئەو گەلەی كە بیر بكاتەوە، مێشێك كە ئەگەر بكەوێتە مشتە ئاوێكەوە عەقڵی خۆ رزگاركردنی نیە كێ فێری ئەو نەخشەو پاكو خاوێنیەی كردوە؟! جا بۆ بیر ناكەنەوەو سوودی دنیاو قیامەتی لێوەرگرن؟ دەڵێن: جارێك كابرایەك چووە خزمەتی پێغەمبەرو ﷺ وتی: براكەم توشی نەخۆشی سك چون بوە پێغەمبەرﷺ فەرموی: هەنگوینی بدرێ، كابرا هەنگوینی پێدا سك چونكە زیاتر بو، هاتەوە بۆ لایو عەرزی كرد كە خراپتر بووە،فەرموی: هەنگوینی بدەرێوبەچەند جارێك ئینجا شیفای بۆ هاتو فەرمویَ:{ صَدَقَ ا ُ وَكَذَبَ بَطْنُ أَخِيك / متفق عليه/ خوا راستی كرد سكی براكەت درۆی كرد} ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە چارەسەریو تیماركردنی نخۆشی پێچەوانەی ئایین نییەو زیانی بۆ بیرو باوەڕ نیە مادام كابرا لە خواوەی بزانێ:

(٧٠) جا(ﷲ) ئەو زاتەیە كە ئێوەی دروستكردوەو لە پاشان ئەتان مرێنێتوهەندێك لە ئێوە تەمەنێكی زۆری پێ ئەدرێو عەقڵی منداڵ ئەبێتەوە تا هیچ نەزانێت پاش ئەوەی كە زانیوێەتی بێگومان(ﷲ) زۆر زانایەو بە دەسەڵاتە، پێغەمبەرمانﷺئەپاڕایەو لە (ﷲ) و ئەیفەرمو:{ وَأَعُوذُ بِكَ أنْ أُرَد إ أَرْذَلِ العُمُر/وە پەنا ئەگەرم بەتۆ كە بگەرێنرێمەوە بۆ عەقڵی منداڵی ئەوەندە تەمەن درێژ بم} البخاري وغ ه.

(٧١) خۆ (ﷲ) ئەو زاتەیەكە هەندێكتان بەرز دەكاتەوە بەسەر هەندێكی ترتاندا بەهۆی رژاندنی رۆزی زۆرەوە دەی ئەوانەی كەوا رێزیان پێدراوە لەو رزقو رۆزی خۆیانە هیچ نادەن بەوانەی كەلە ژێر دەستیاندایە، جا هەمویان لەو رزقو رۆزییەدا یەكسان بن، واتە: ئیتر چۆن ئێوە چاوەڕێ ئەكەن كە خوای خاوەنی ئەم هەمو بوونەوەرە بەندەی خۆی بكات بەشەریكی خۆیو هەندێ لە كارو بارەكانی خۆی بداتە دەستی ئەوان؟ ئایا ئێوە دان نانێن بە نیعمەتەكانی خوادا؟ لێ پرسینەكە بۆ سەرزەنشت و دان پێدانانە، واتە: بۆ ئەبێ دان بەو نیعمەتانەی خودادا نەنێن، دانی پێدا بنێنو بزانن كەخوا كەسی نەكردوە بە هاوبەشی خۆیو ئێوە لە خۆتانەوە ئەم شتانەتان كردوە بە هاوبەشی (ﷲ).

(٧٢) وە خوا ئەو زاتەیە كە لە خۆتان هاوسەری بۆ داناونو لە رێگەی ئەو هاوسەرانەوە كوڕانو نەوەی پێداونو لە شتە پاكەكان رزقی ئێوەی داوە ئایا ئێوە بەشتی پڕوپوچ كە ئەو بتانەن باوەڕ

وَيَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ رِزۡقٗا مِّنَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ وَأَنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٧٤﴾ ۞ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا عَبۡدٗا مَّمۡلُوكٗا لَّا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَمَن رَّزَقۡنَٰهُ مِنَّا رِزۡقًا حَسَنٗا فَهُوَ يُنفِقُ مِنۡهُ سِرّٗا وَجَهۡرًاۖ هَلۡ يَسۡتَوُۥنَۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلَيۡنِ أَحَدُهُمَآ أَبۡكَمُ لَا يَقۡدِرُ عَلَىٰ شَيۡءٖ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوۡلَىٰهُ أَيۡنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأۡتِ بِخَيۡرٍۖ هَلۡ يَسۡتَوِي هُوَ وَمَن يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَمَآ أَمۡرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمۡحِ ٱلۡبَصَرِ أَوۡ هُوَ أَقۡرَبُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٧٧﴾ وَٱللَّهُ أَخۡرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ إِلَى ٱلطَّيۡرِ مُسَخَّرَٰتٖ فِي جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمۡسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٧٩﴾

ئەهێنن كەهیچیان لێ نایەتو دان بەنیعمەتەكانی خوادا نانێنو ئینكاری ئەو هەمو نیعمەتانەی ئەو زاتە دەكەن؟

(٧٣) وە ئێوە جگە لە (ﷲ) شتانێك دەپەرستن كە ئەوانە خاوەنی هیچ رزقێك نین بۆ ئێوە نە لە ئاسمانانو نە لە زەویداو تواناى ئەنجامدانی هیچ شتێكیشیان نییە نە چاكو نە خراپ. جا كە ئەمەتان زانی،

(٧٤) ئێوە هاوبەشو هاووێنەو شەریك بۆ خوا دانەنێن، چونكە شتی وانییەو درۆیەو تەنها ئایندەی خۆتان خراپ ئەكەن بەراستی خوا ئەزانێت چ شتێك سوودی هەیە بۆتانو چیش بە زیانتانەو ئێوە نازانن. ئینجا خوا وێنەیەك لەسەر ئەو بتانەی ئەوانو تەنهایی خۆی دێنێو دەفەرموێ:

(٧٥) خوا وێنەیەك باس دەكات لەسەر بتەكانو لەسەر زاتی خۆی بەم چەشنە كە مرۆڤێك مولكی كابرایەك بێو تواناى هیچ شتێكی نەبێت كە بیكات نە بۆ خۆیو نە بۆ خەڵك ئا ئەمە لەگەڵ كەسێكدا كە ئێمە رزقیكی چاكمان پێ دابێتو ئەویش بە كەیفی خۆی بە پەنامەكیو بە ئاشكرا بیبەخشێت ئایا ئەم دووانە وەك یەكن؟ ئاشكرایە وەك یەك نین دەی بتەكان وەك كابرای یەكەمەو خۆیان بەندەنو تواناى هیچ ئیشێكیان نیە،دووهەمیان وێنەی خوا خۆیەتی كە خاوەنی ئەو هەمو خێرو بەرەكەتەیەو هەمیشە بە ئارەزۆی خۆی ئەبەخشێتو كەس

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ
ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ
وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ
﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم
مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ
ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ
عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا
وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾ وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ
شَهِيدٗا ثُمَّ لَا يُؤۡذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُواْ وَلَا هُمۡ يُسۡتَعۡتَبُونَ
﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ ٱلۡعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُمۡ وَلَا هُمۡ
يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْ شُرَكَآءَهُمۡ
قَالُواْ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدۡعُواْ مِن دُونِكَۖ
فَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلَ إِنَّكُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلۡقَوۡاْ
إِلَى ٱللَّهِ يَوۡمَئِذٍ ٱلسَّلَمَۖ وَضَلَّ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿٨٧﴾

ناتوانێ ڕێگای لێ بگرێتو دەست بخاتە ناو کاروبارییەوە کەوابو سوپاس بۆ خوا، بەڵام زۆربەی ئەوان نازانن کە سوپاس شایستەی خودایەو بت پەرستن هەر یەکەو بەشێوەیە، یەکێك گیاندار ئەپەرستێو یەکێ بێ گیان، یەکێ نەفسی خۆی ئەپەرستێو یەکێ خەڵکی تر، یەکێ ماڵ ومنداڵ یەکێ تر پلەو مەقام و...و...هتد. وتراوە کەئەم ئایەتە لەبارەی عوسمانی کوڕی عەفانو بەندەیەکی ئەوەوە دابەزیوەکە عوسمان ـ خوا لێی ڕازیبێت ـ خەرجی دەداو بەخێوی دەکرد بەڵام ئەو ئیسلامی خۆش نەدەویستو ڕێگری لەخێرو چاکەی ئەو دەکرد. ئینجا ﷲ وێنەیەکی تر باس دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٧٦﴾ خوا وێنەیەکی تر بەم شێوەیە باس دەکات: کە دوو پیاو هەبنو یەکێکیان لاڵ بێتو نەتوانێت هیچ شتێك بکات بەڵکو ئەو بارێکی قورس بێت بەسەر ئاغاکەیەوەو بەرەو هەر کوێ بڕوات خێرێك نەهێنێتەوە ئایا ئەم کەسە لەگەڵ ئەو کەسەی کە فەرمان بەداد پەروەری بداتو ئەو لەسەر ڕێگای ڕاست بێت یەکسانە؟ ئەم وێنەیەش مەبەستی کافرو موسڵمانە، یەکەمیان وێنەی کافرەو لەقسەی حەقو ڕاستدا لاڵەو توانای هیچ چاکەیەکی نیەو بەرەو هەرکوێ بچێو هەرچی بکات هەربەزیانی تەواو دەبێو دووهەمیانیش موسڵمانەو فەرمان بەداد پەروەری دەکات کە یەکخوا پەرستییەو لەسەر ڕێگای ڕاستە کە ئاینی ئیسلامە.

﴿٧٧﴾ ئەوسا هەر بۆ (ﷲ)یە زانینی نهێنیەکانی ئاسمانانو زەویو کەسی تر ڕاستەوخۆ هیچی لێ نازانێت تا(ﷲ)خۆی پێی ڕانەگەیەنێتو بڕیاری هاتنی قیامەت هەر بەئەندازەی چاوکلا کردنێکە یان لەوەش نزیکترە تەنها ئەوەندەی دەوێ کە خوا بفەرموێ: ببە، ئەبێ چونکە بەڕاستی (ﷲ) دەسەڵاتی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە، دیسان زیاتر درێژە بە باسی نیعمەتەکانی خۆی ئەداتو دەفەرموێ:

﴿٧٨﴾ جا ﷲ ئەو زاتەیە کە ئێوەی دەرهێناوە لە سکی دایکتاندا کە هیچ شتێکتان نەدەزانی، ئینجا بۆ ئەوەی شت بزانن خوا بۆ ئێوە ئامێری بیستنو بینینو دڵەکانی داناوە تا لە بیسراوەکانو بینراوەکان پەندو ئامۆژگاری وەرگرنو هەرلەو ڕێگایەوە بینراوو بیسراوەکان بدەن بەدڵو بەچاکی تەماشای سودو زیانیان بکەنو گەورەیو زۆری نیعمەتەکانی خواتان بۆ دەرکەوێت بەڵکو ئێوە سوپاسی خوابکەن. جارێکی تر پەروەردگاری عالەم سرنجمان ڕائەکێشێ بۆ لای هەندێ لەو شتانەی کە دەسەڵاتو زانایيو دانایی خودا دەر ئەخەنو دەفەرموێ:

﴿٧٩﴾ ئایا نابیننو تەماشای ئەو باڵندانە ناکەن کە چۆن گەردنکەچو ڕام کراوون لە بۆشایی ئاسماندا دەگەڕێن بێ ئەوەی بکەونە خوارەوە بەڕاستی ئەوانی ڕاگیر نەکردوە جگە لە خواو کەسی تر ناتوانێ لەو بۆشاییەدا ڕاگیریان بکات بێگومان ئا لەوەدا چەندین بەڵگەی گەورە هەیە لەسەر دەسەڵاتی خوا بۆ گەلێك کە باوەڕ بهێننو یەقینیان هەبێت بە خواو بە ڕۆژی قیامەت .

﴿٨٠﴾ خۆخوای باڵادەست ئەو زاتەیە کە ماڵەکانتانی کردوە بە جێگای حەسانەوەتان بۆ ئەوەی کە ئیسراحەتی تێدا بکەن لەدنیادا، وەلە پێستی مەڕو ماڵات ماڵانێکی پێداون کە هەڵگرتنیان لەکاتی کۆچوباردا و لەکاتی نیشتە جێبونتاندا سوكو ئاسانەلاتان وله خوریەکانیانولە کورکەکانیانو لە مووەکانیان ماڵ دروست ئەکەن وەك ڕەشماڵو چادرو کەلو پەلی تری ناو ماڵ، وە هۆی لەزەت وەرگرتنتانە هەتا ماوەیەکی دیاری کراو کە کاتی دەرچونتانە لەم ژیانەی دنیادا، وە هەروەها خوا دەفەرموێ:

﴿٨١﴾ جا خوای باڵادەست هەندێك لە وانەی کە دروستیکردوە کردویەتی بە سێبەر بۆ ئێوە کە لەکاتی گەرمادا سودی هەیە بۆ خۆتانو مەڕو ماڵاتتانو لەچیاکانیشدا ئەشکەوتانی گەورەو بچوکی بۆ دروستکردوون، وە پۆشاکێکی وای بۆ داناون کە ئەتان پارێزێت لە گەرما، وە پۆشاكو لباسێکی وای بۆ داناون لەزرێ کە

بتان پارێزێ لەکاتی شەڕدا لەرمو تیر هەر ئاوا خوای باڵادەست نیعمەتەکانی خۆی تەواو دەکات بەسەر ئێوەدا، بەڵکو ئێوەش گەردنکەچبن بۆ خواو ڕێگای خوا بگرن،

(٨٢) ئەگەر ئەوان گوێ بەم ئاییننەدەن‌و پشتی تێ بکەن لەگەڵ بونی ئەم هەمو بەڵگە زۆرو گەورانەدا تۆ نارەحەت مەبە ئەی محمدﷺچونکە بەراستی تۆ تەنها گەیاندنێکی روون‌و ئاشکرات لەسەرەو هیچی تر.

(٨٣) ئەوان نیعمەتەکانی خوا ئەناسن‌و دەڵێن: ئەمانە هی خودان بەڵام لەکاتی قسەو باس دا ئینکاری دەکەن، وە زۆربەیان بێباوەڕن‌و کوفرانی نیعمەتەکانی خودا دەکەن جا خوا هەڕەشەیان لێدەکات‌و دەفەرموێ:

(٨٤) جا ئەو رۆژەی کە ئێمە لە ناو هەمو گەلێك شایەتێك کە پێغەمبەرەکەیانە زیندو دەکەینەوەو تاوان‌و ستەمی گەلەکەی باس دەکات‌و مەحکوم دەبن لە پاشا ماوە نادرێ بەو کەسانەی کە بێباوەڕ بوون هیچ بەهانەیەك بهێننەوەو داوای پەشیمان بوونەوەیشیان لێ ناکرێت چونکە تازە لە دنیای ئیش‌وکاردا نەماون، بەڵکولە دنیای پاداشت‌و سزادان، کەوابو ئەو رۆژە زۆر سەختە بۆ تاوانباران وەك لێرە دیمەنێکیان باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٨٥) کاتێك کە ئەوانەی تاوان‌و ستەمیان کردوە سزا ئەبینن تازە نە سوك ئەکرێت لەسەریان‌و نەماوەیشیان پێ ئەدرێت بەڵکو ئەبێ بە تێرو تەواوی سزای خۆیان وەرگرن.

(٨٦) جا کاتێك کە ئەوانەی هاوبەشیان داناوە بۆ خوا چاویان بە شەریکەکانیان ئەکەوێت کە چەند هیچ‌و پوچ‌و بێ دەسەڵاتن دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئا ئەمانە بتو شەریکەکانی ئێمە بوون کە جگە لە تۆ لە دنیادا بانگمان ئەکردن‌و بەندایەتیمان بۆ ئەکردن ئەوانیش بەپەلە وەڵامیان ئەدەنەوەو دەڵێن: بەراستی ئێوە درۆ ئەکەن‌و بەندایەتی ئێمەتان نەکردوە ، بەڵێ ئەو رۆژە وەك ئەمرۆ نیە کە لوتی خۆیان بەرز بکەنەوەو خەڵکی بکەن بە بەندەی خۆیان‌و ترسیان لەکەس نەبێ، ئەو رۆژە هەمو هێزو دەسەڵاتیان لێوەرئەگیرێت ولە ناو گێژاوی رۆژ رەشی‌و شەرمەندەی‌و سەرشۆڕیدا ئەخولێنەوە، جا دوا کەوتو پەستو بێ نرخەکان پاش ئەو لێدوانەیان هیچیان پێ ناکرێ،

(٨٧) ئەوسا هەمویان روو ئەکەنە ﷲو تەسلیم دەبن، چونکە هیچ چارەیەکی تریان نیە وئەو درۆو دەلەسانەش کە لە دنیادا کردبویان هەمویان لێ ون دەبێت‌و دەڕوات‌و هیچ قسەیەکیان نیە لەو رۆژەدا کە بۆ کردن بشێت.

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدۡنَٰهُمۡ عَذَابٗا فَوۡقَ ٱلۡعَذَابِ بِمَا كَانُواْ يُفۡسِدُونَ (٨٨) وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ وَجِئۡنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ (٨٩) إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ (٩٠) وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ بَعۡدَ تَوۡكِيدِهَا وَقَدۡ جَعَلۡتُمُ ٱللَّهَ عَلَيۡكُمۡ كَفِيلًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ (٩١) وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّتِي نَقَضَتۡ غَزۡلَهَا مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثٗا تَتَّخِذُونَ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِيَ أَرۡبَىٰ مِنۡ أُمَّةٍۚ إِنَّمَا يَبۡلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦۚ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ (٩٢) وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَلَتُسۡـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ (٩٣)

(٨٨) ئەوانەی کە کافر بوون‌و ڕێگری لە ئاینی ﷲ دەکەن‌و نایەڵن بڵاوببێتەوە خوا دەفەرموێ: ئێمە سزا لەسەر سزایان بۆ زیاد ئەکەین، وەك دنیانیە کە کەم کەم سزاو تۆڵەی ئاسان ببێ بەڵکو رۆژلەپاش رۆژ سزایان زیاتر ئەبێ بەهۆی ئەوەی کە لە دنیادا تاوان‌و خراپەیان کردوەو بەزەییان نە بەخۆیاندا هاتوەتەوەو نە بەخەڵکا.

(٨٩) جا ئەو سزاو تۆڵەیە لەو رۆژەدا ئەبێت کە ئێمە لە هەمو گەلێك شایەتێك لە خۆیان زیندو دەکەینەوە کە پێغەمبەرەکەیانەو، وە ئەی محمد ﷺ تۆیش دەهێنین کە شایەت بیت لەسەر ئەمانە، وەئێمە ئەم قوئانەمان رەوانەکردوە بۆ تۆ کە رۆشن کەرەوەیە بۆ هەر شتێك کە مرۆڤ پێویستی پێی هەبێ لەبارەی بەندایەتی‌و خواناسی‌و حەڵاڵ‌و حەرامەوە ورێنمای‌و سۆزو مژدەیە بۆ تەواوی موسڵمانان. دەی ئیتر لەپاش ئەو پەڕاوە بەنرخە کەی رەوایە کە خەڵك یاساو بەرنامەیەکی تردابنێن بۆ کاروباری خۆیان؟ وە چۆن ئەم کارەیان بەشەڕ لەگەڵ ﷲ دا حیساب ناکەن؟! ئەی مرۆڤ بیربکەرەوە تا فرسەتت ماوە بزانە کێ دروستی کردویت‌و بۆچی دروستی کردویت؟ بەڵێ ئا لەو رۆژەدا تاوانباران‌و یاخی بوان لە فەرمانی ﷲ دەزانن چیيان کردوەو قەپ بە دەستی خۆیاندا دەکەن‌و پەشیمان دەبنەوە بەڵام بێ سودە.

وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُۥ لَيۡسَ لَهُۥ سُلۡطَٰنٌ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلۡطَٰنُهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ يَتَوَلَّوۡنَهُۥ وَٱلَّذِينَ هُم بِهِۦ مُشۡرِكُونَ ﴿١٠٠﴾ وَإِذَا بَدَّلۡنَآ ءَايَةٗ مَّكَانَ ءَايَةٖ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفۡتَرِۭۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلۡحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٠٢﴾

﴿٩٠﴾ بێگومان کە ﷲ فەرمان ئەدات بە دادپەروەری لە وتارو کردارو کێشانەو پێوانەداو فەرمان ئەدات بە چاکە، واتە: هەر شتێك چاك بێ خوا فەرمان ئەدات بە ئەنجام دانیو فەرمان ئەدات بە بەخشینی ماڵ بە نزیکان لە خزمو هاوسێ کە بۆ خزم چاکە دوو بەرانبەرە هەم چاکەیە هەم خزمایەتییەو بەرگری دەکات لە داوێن پیسیو ئیشی خراپەو ستەم ﷲ ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو ئێوەش بیر بکەنەوەو واز لەتاوانو ستەمو خراپە بهێنن‌و خۆشبەختی هەردوو دنیا بەدەست بهێنن. بەراستی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەشێوەیەکی کورتو رۆشن هەمو گۆشەکانی ژیان ئەگەرێتەوەو هیوادارم بەچاکی تەماشای بکەن‌و سودی لێ وەرگرن .

﴿٩١﴾ وەفا بکەن بەو پەیمانەی کە ئەیدەن بە ﷲو جێ بەجێی بکەن‌و هەر کاتێك کە پەیمانتاندا سوێندەکانتان هەڵنەوەشێننەوە دوای ئەوەی کە زیاتر بتەوترتان کردوەو بڕیاری جێ بەجێ کردنتان داوە، وەبەحەقیقەت ئێوە خواتان کردوە بەپاڵ پشتو زامن لەسەر بەڵێن‌و سوێندەکانتان، ئیتر چۆن ئەتوانن هەڵی بوەشێننەوە؟ بێگومان ﷲ دەزانێت کە ئێوە چی دەکەن.

﴿٩٢﴾ جا ئێوە وەك ئەو ئافرەتە مەبن کە ریسەکەی خۆی پاش ئەوەی کە دەیرێساو بتەوو بەهێزی دەکرد هەڵی دەوەشاندەوە کە بە سوێندو پەیمان بەستنەکانتان خۆتان توندو تۆڵ بکەن کەئەمە شتێکی باشە بەڵام لەپاشدا لەبەر بەرژەوەندییەکی دنیایی هەڵیوەشێننەوە، کە ئێوەش سوێندەکانتان ببێت بەهۆی خیانەت لە نێوانتاندا لەبەر ئەوەی گەلێکی زۆرترو بەسام تر لە گەلێکی تر هەببێت، واتە: لە کاتی کەم دەسەڵاتیو لاوازیدا سوێند ئەخۆن بۆ کەسانی بەهێزتر لە خۆتان بەڵام هەر کە دیتان خۆتان بەهێز ترن ئەکشێنەوەو خیانەت بەوەی پێشو ئەکەن، کە ئەمە خیانەتەو موسڵمان نابێ خیانەت لە یەکتر بکاتو یەکتر لاوازو بێ هێز بکات بەڵکو پێویستە زیاتر یەکتر بەهێز بکەن، خوای باڵادەست ئێوە تاقی دەکاتەوە بەوەی کە ئایا ئێوە پەیمان‌و سوێندەکانتان هەڵئەوەشێننەوە یان بەچاکی ئەنجامی ئەدەن؟ وە ئەو زیادو کەم کردنەوەی هێزو دەسەڵاتەش هەر تاقی کردنەوەیەو دڵنیا بن کە خوای باڵا دەست سەرئەنجام لە رۆژی قیامەتدا ئەم راستیانەی کە ناڕێکن تێیدا کە هاتنی قیامەتو حیسابو کیتابە بۆتان رۆشن دەکاتەوە، جا ئەوکاتە دەزانن چیتان کردوە. گوایە دەڵێن لە مەکەدا ئافرەتێك هەبوە کە بەیانی تا ئێوارە رێسی ئەرێساو دووبارە خاوی دەکردەوە واتە: ئیشێکی بێ سوودی دەکرد، بەداخەوە زۆرێك لە موسڵمانانی ئەمڕۆ ئاوەها رەفتار دەکەن‌و وەك گوڵە بەرۆژە هەردەم رووبیان لەلایەکەو بیجگە لە سوکیو تاوانباری هیچ بەرهەمێکی تریان دەست ناکەوێت. جا بۆ ئەوەی چاکتر بزانین کە ئەمانە تاقی کردنەوەن ﷲ یە دەفەرموێ:

﴿٩٣﴾ ئەگەر ﷲ ئارەزۆی لێبوایە ئەیکردن بەیەك گەل‌و هەموتان یەك قسەئەبون بەڵام خوا گومڕا دەکات ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێتو رێنمایش دەکات ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت، لێرەدا بە دوو مانا دەگونجێت:

**یەکەمیان**: رێنمایو گومڕاهی تەنها بە دەست خوایە

**دوهەمیان**:خوا ناو دەرونی مرۆڤ ئەناسێ کێ بەخوای خۆی رازیە رێنمای دەکات وەکێیش دژی خوایە گومڕاهی دەکات. دڵنیا بن کە پرسیارتان لێ ئەکرێت لەو ئیشانەی کە دەیکەن.

﴿٩٤﴾ نەکەن سوێندەکانتان بکەن بەهۆی خیانەت لە نێوان خۆتاندا، جا پێی هەڵکەوێتو شکست بخوات پاش بتەو بونی، واتە: بە سوێندی درۆ خیانەت لە یەکتر مەکەن‌و پاش بەهێز بوون خۆتان لاوازو بێ هێز مەکەن بەهۆی لەیەك دابڕانتانەوە، ئایندەیەکی خراپتان ئەبێ چونکە ئێوە رێگای بڵاوبونەوەی ئاینی خواتان گرتوەو بوون بەربەستێك لەرێگای خوادا، وە بۆ ئێوە هەیە سزایەکی گەورە،چونکە ئەو هەمو تاوانانەتان ئەنجام داوە لە پەیمان شکێنیو سوێندی درۆ خواردن‌و جیابونەوە لەیەكو

لاواز کردنی ریزی باوەڕداران. جارێکی تر الله پەیمان شکێنیەکانیان باس دەکات ودەفەرموێ:

(٩٥) ئەوسا پەیمانەکانی الله مەفرۆشن بە نرخێکی کەم، واتە: کاتێ پەیمان بەالله ئەدەن نەکەن بەسەروەتو سامانو ناوو پلەی دنیا بیگۆڕنەوە، چونکە هەر ئەوەی کە لەلای (الله)یە چاکە بۆ ئێوە ئەگەرئەم حەقیقەتە بزانن.

(٩٦) ئەوەی کە لەلای خۆتانە لەسەروەتو سامانو پلەو ناوو شۆرەت هەموی لە ناو ئەچێتو نامێنێت، وە ئەوەی کەلەلای خوایەو بۆ ئەوتان ئەنجام داوە هەر ئەوە ئەمێنێتەوە بۆ تان، ئینجا الله دەفەرموێ: جا بەراستی ئێمە پاداشت ئەدەین بەو کەسانەی کە خۆیان گرتوە لە سەر بەندایەتیو دوور کەوتنەوە لە تاوانو ئارامبون لەکاتی هاتنی ئێشو ئازاری دنیایی بەسەریاندا بە پاداشتێکی جوانترو چاکتر لەوەی کە کردویانە .

(٩٧) ئەو کەسەی کە ئیشی چاکی کرد پیاو بێت یان ئافرەت، کە ئەو کەسە باوەڕدار بێ ئێمە ئەیژێنین لە دنیادا بە ژیانێکی پاکو خاوێن لە داوێن پیسیو حەرام خۆریو خیانەتکاریو پاداشیان ئەدەینەوە بە جوانتر لەوەی کە خۆیان ئەنجامیان داوە، پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:{ إن ا لَا يَظْلِمُ مُؤْمِنًا حَسَنَةً يُعْطَى بِهَا فِي الدُّنْيَا وَيُجْزَى بِهَا فِي الْآخِرَةِ وَأَما الْكَافِرُ فَيُطْعَمُ بِحَسَنَاتِ مَا عَمِلَ بِهَا لِلهِ فِي الدُّنْيَا حَتى إِذَا أَفْضَى إِلَى الْآخِرَةِ لَمْ تَكُنْ لَهُ حَسَنَةٌ يُجْزَى بِهَا /مسلم وا د/بەراستی خوا ستەم لە هیچ باوەڕدارێك ناکات بۆ هیچ چاکەیەك کە لە دنیادا ئەیکات بەهۆی ئەو چاکەوە چاکەی لەگەڵدا ئەکرێ لەدنیاداو لە رۆژی دوایشدا پاداشی پێ ئەدرێتەوە لەسەر ئەو چاکەیە، بەڵام بێباوەڕ بەهۆی ئەو چاکانەیەوە کە لەبەر خوا ئەنجامی داوە رۆزیو خواردەمەنی پێ ئەدرێ لەدنیادا تا ئەو کاتەی کە چوو بۆ ماڵی دوایی هیچ چاکەیەکی بۆ نەمێنێتەوە کە پاداشی پێ بدرێتەوە}

واتە: باوەڕدار خوا بە زیادەوە فەزڵی خۆی جگە لەوەی کە لەسەر چاکەکانی ژیانی دنیای بۆ چاك دەکات پاداشتی قیامەتیشی بە چاکتر لەوەی خۆی ئەداتەوە بەڵام دادوەرانە لەگەڵ بێ باوەڕاندا حیساب دەکاتو هەرچی چاکە بکەن خوا لەدنیادا رۆزیو خواردنو ژیانی چاکیان پێ ئەدات لەسەر چاکەکانیان بەڵام لە فەزڵو بەرەکەتی خۆی بێ بەشیان دەکات لە پاشەرۆژدا . ئینجا الله دەفەرموێ:

(٩٨) هەر کاتێ ویستت قورئان بخوێنی پەنا بگرە بە خوا لە شەیتانی دەرکراو لە رەحمو سۆزی خوا، واتە سوننەتە هەرکاتێ کەسێ ویستی قورئان بخوێنێ بڵێ ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴾ تا

وَلَقَدۡ نَعۡلَمُ أَنَّهُمۡ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٞۗ لِّسَانُ ٱلَّذِي يُلۡحِدُونَ إِلَيۡهِ أَعۡجَمِيّٞ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِيّٞ مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهۡدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفۡتَرِي ٱلۡكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾

خوا دوری بخاتەوە لە خەتەراتی شەیتان وبەئارامو تێ فکرانەوە ئەو قورئانەی بخوێنێ بەڵکو سودی لێ وەرگرێت.

(٩٩) بێگومان کە شەیتان هیچ دەسەڵاتێکی نیە بەسەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو تەنها بەخوای خۆیان پشت دەبەستن کە ﴿ أَعُوذُ بِٱللَّهِ ﴾ بەڵگەی پشت بەستنێتی بەخوا، واتە: مادام راست بکەیت لە پشت بەستن بەالله ئیتر مەترسە لەشەڕی شەیتان.

(١٠٠) چونکە شەیتان دەسەڵاتی هەر بەسەر کەسانێکدا هەیە کە خۆیان شەیتان دەکەن بەسەرپەرشتو رەئیسی خۆیان وئەوانەیش کە بەهۆی فرِوفێڵی شەیتانەوە هاوەڵیان بۆ خواداناوەو موشریکن، ئینجا الله بەرپەرچی گومانێکی بێباوەڕان ئەداتەوەو دەفەرموێ:

(١٠١) جا هەر کاتێك ئێمە ئایەتێك دانێین لە جێاتی ئایەتێکی تردا لە بەر بەرژەوەندییەكو تاقی کردنەوەیەك کە خۆمان ئەیزانین ـ وەخوا زاناترە بەوەی کەرەوانەی دەکات لەکەسانی تر- دەڵێن: تۆ ئەی محمدﷺجگە لە مرۆڤێکی درۆزن شتێکی تر نیت، واتە: هەندێ جار ئەیان وت پێغەمبەر درۆزنە هەروەك ئەیان وت: جادوگەرو پێشبینی کەرو شاعیرە جا وا سەریان لێ تێك چوبو هەر رۆژەی جۆرە قسەیەکی ناشیرینیان ئەکرد، جا خوا دەفەرموێ: واز بێنە لەو قسانە: بەراستی زۆربەی ئەوان نازانن

﴿يَوۡمَ تَأۡتِي كُلُّ نَفۡسٖ تُجَٰدِلُ عَن نَّفۡسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ١١١ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا قَرۡيَةٗ كَانَتۡ ءَامِنَةٗ مُّطۡمَئِنَّةٗ يَأۡتِيهَا رِزۡقُهَا رَغَدٗا مِّن كُلِّ مَكَانٖ فَكَفَرَتۡ بِأَنۡعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلۡجُوعِ وَٱلۡخَوۡفِ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١١٢ وَلَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مِّنۡهُمۡ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلۡعَذَابُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ١١٣ فَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗا وَٱشۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ١١٤ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحۡمَ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۖ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١١٥ وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلۡسِنَتُكُمُ ٱلۡكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٞ وَهَٰذَا حَرَامٞ لِّتَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ لَا يُفۡلِحُونَ ١١٦ مَتَٰعٞ قَلِيلٞ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١١٧ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا مَا قَصَصۡنَا عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُۖ وَمَا ظَلَمۡنَٰهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٨﴾

حەق‌و ناحەق کامەیە ونەفامن‌و نازانن چی دەڵێن: بۆیە ئەم قسە پڕوپوچانە دەکەن.

(١٠٢) ئەی محمد ﷺ بڵێ: جبرەئیلی پاك‌و پیرۆز لەلایەن پەروەدگارتەوە بۆ بەمەبەستێکی ڕاستو ڕەوا ئەم قورئانەی هێناوە تا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێ هێناوە بەگوڕو بەتین تر بکات‌و ڕێنمایی‌و موژدەر بێت بۆ موسڵمانان بە بەهەشتی هەتاهەتایی‌و ڕەزامەندی ﷻ،

(١٠٣) جا بەحەقیقەت ئێمە ئەزانین کە ئەوان دەڵێن: ئەوەی کە محمدی فێری ئەو قورئانە کردوە بەشەرێکە، ﷻ دەفەرموێ زمانی ئەو کابرایەی کە ئەوان دەڵێن: ئەم قورئانەی بە تۆ وتوە عەجەمەو عەرەبی نازانێت دەی خۆ ئەمە بە زمانێکی عەرەبییەو ڕۆشنکەرەوەی ڕاستو ناراستە ئیتر چۆن دەڵێن: ئەو کابرا عەجەمەی کە بە باشی ناتوانێت بە عەرەبی قسەبکات ئەم قورئانە ڕەوان‌وڕۆشنەی بە تۆ وتوە؟! دەی خۆ ئەوان عەرەبن ئەگەر ئەتوانن باسورەتێکی وەك ئەم قورئانە بهێنن‌وکاری خۆیان لەگەل تۆدا ببڕنەوە، یان واز لەم درۆو دەلەسەیە بهێنن؟! ئەڵێن: پیاوێکی غەیرە عەرەب لەمەکەدا ئاسنگەری دەکردوشارەزای تەورات بو، پێغەمبەر ﷺ جارجارێك دەچو لەلای دادەنیشت، جا بت پەرستان دەیانگوت ئەو ئەم قورئانە بەمحمد دەڵێت، جا خوا بەم ئایەتە دەمکوتی کردن.

(١٠٤) بەڕاستی ئەو کەسانەی کە بە ئایەتەکانی خوا باوەڕیان نیە، خوا ڕێنماییان ناکات‌و باوەڕ ناهێنن، وەبۆ ئەوان هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی دەردناك.

(١٠٥) بێگومان هەرئەوانەن درۆ دروست دەکەن کە باوەڕیان نیە بە نیشانەو بەڵگەکانی دەسەڵات‌و هێزی ﷻ ،وە هەر ئەوانە خۆیان درۆزن، جا کەسێك کە پێغەمبەری خوا بێ چۆن درۆ دەکات؟

(١٠٦) خۆ کەسێك درۆ دەکات کە کافر بێت بە خوا پاش ئەوەی کە باوەڕی هەبوەو پاشگەز بووبێتەوە، واتە:درۆزن تەنها لەناو کافراندایە بەڵێ: درۆ مرۆڤ ئەوەندە بێ نرخ دەکات ئەبێ تەنها لەناو کافراندا پەیدای بکەیت بەڵام ئەو کەسەی کە زۆری لێ ئەکرێت کە خۆی کافر بکات‌و دڵی ئارامە لەسەر خوا پەرستی‌و ئایین ناچێتە ریزی درۆزنانەوە، بەڵام کەسێك دەبێت بە درۆزن‌و درۆ هەڵ ئەبەستێت کە دڵی زۆر شادو خۆشبێت بەکوفر، جا لەسەر ئەو کەسانە تورەی‌و رقی خوا هەیەو بۆ ئەوان سزایەکی گەورە هەیە. وە ئەم ئایەتە دەڵێن: دەربارەی عەممار هاتوە لەکاتی خۆی لەگەڵ دایك‌و باوکی وکۆمەڵێکی لاوازی تری وەك بیلال‌و خەباب‌و سالم، زۆرسزادران‌و یاسری باوکی وسومەیەی دایکی شەهید کران‌و عەماریش لەپاش ئەوە چییان پێ وت بۆ ئەوەی لە مردن خۆی ڕزگار بکات وتی: بەڵام دڵی هیچ نەگۆڕا بو پاش ڕزگاربونی شکاتی قسەکانی خۆی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ کردو پێغەمبەر فەرموی: {كَيْفَ تَجِدُ قَلْبَكَ /البيهقي، ا اکم/ دڵت چۆن بو؟ وتی: ئارام بو لە ئیمان، فەرموی: { فَإِنْ عَادُوا ، فَعُدْ/ ئەگەر دووبارە گەڕانەوە بۆ سزادانت تۆش هەمان قسە بکە} ئەگەرچی ئەم فەرمودەیە ئیبوکسیر لە (ارشاد الفقیه) بە صەحیحی داناوە بەڵام ئەلبانی بە (مرسل) دای ناوە.

بەڵێ چاکترو بەنرختر ئەوەیە کە مرۆڤ لەسەر بیرو باوەڕی خۆی ڕاوەستێت ئەگەر چی بزانێت لەسەر ئەو خۆگریەی گیان لەدەست دەدات وەك چۆن ئیبنوعەساکیر لە بارەی عەبدولای کوڕی حوزافەی سەهمی کەیەکێکە لەیارانی پێغەمبەرمان ﷺ ئەگێڕێتەوە کە ڕۆم گرتی و بردیانە لای پاشاکەیان ئەویش پێی وت: ببە بەگاور من ئەتکەم بە هاوبەشی خۆم لەهەمو سەروەت‌و سامانداو کچەکەی خۆمت پێ ئەدەم، وتی: ئەگەر تەواوی موڵکی خۆت‌و موڵکی عەرەبیشم پێ بدەیت لەسەر ئەوەی کەبگەڕێمەوەلەم ئایینەی محمد ﷺ یەك چاو برکەیەکیش بێت نایکەم، پاشان وتی: ئەتکوژم، وتی: ئەوە بە کەیفی خۆتە، فەرمانی دا هەڵبەسراو بەتیر هاوێژانی وت: تیری تێ بگرن بۆ

نزیکی دەستو قاچیو خۆیشی هەرخەریك بو قسەی لەگەڵ دا ئەکرد کەبیکات بەگاور ئەو هەر لەسەر قسەی خۆی سوربو، له پاشان وتی: دایگرن، ئینجا فەرمانی دا دێزەیەکی گەورەی پڕ لەئاوی کوڵێنراوی بۆئامادەکراو دوو گیراوی موسڵمانی بۆ هێنراو خستیە ناویەوە هەر زۆر زوو تەنها ئێسقانەکانیان مایەوە دیسان پێی وتەوە ببە بەگاور ئەو هەر بەگوێی نەکردو قسەکەی لێ وەرنەگرت جا فەرمانی دا کە ئەویش بخەنە ناویەوە هێنایانو لفیان کرد کە بیخەنە ناویەوە، لەوکاتەدا گریا، پاشا تەماعی تێکردو دیسان بانگی کردەوە بۆ گاوربون، چونکە وایزانی کە ترساوەو پەشیمان بوەتەوە، وتی: من بۆیە گریام چونکە تەنها یەك گیانم هەیە پاش چەند دەقیقەیەك تەواو ئەبێ لەسەر ڕێبازی ﷲ من پێم خۆشبو بە ئەنازەی هەمو موەکانی لەشم ئەوەندە گیانم ببوایەو یەك لەپاش یەك سزابدرایەم لەسەر ﷲ، لەریوایەتی تردا هاتوەکە خستیەبەندیخانەوەو چەند ڕۆژێك هیچی پێ نەدا لە پاشا عارەقو گۆشتی بەرازی بۆناردە بەندیخانەوە ئەویش نزیکی نەبوەوە لەپاشا بانگی کرد وتی: بۆنەت خوارد؟ وتی: خۆئەوە حەلاڵە بۆ من چونکە برسیو ناچاریە بەڵام من شتێ ناکەم کەتۆ کەیفو خۆشبی پێم پاشا وتی: سەرم ماچ بکە ئازادت دەکەم وتی: هەمو گیراوە موسڵمانەکانم لەگەڵدا ئازاد دەکەیت؟ وتی: بەڵێ. جا هەستاو سەری ماچ کرد، ئەویش خۆیو هەمو موسڵمانە گیراوەکانی تری لەگەڵ دا ئازاد کرد. جا کاتێ گەڕایەوە عومەری کوڕی خەتاب ﵁ وتی پێویستە هەمو موسڵمانێك سەری عەبدوڵای کوڕی حوزافە﵁ ماچ بکاتومن پێش هەموتان ئەکەوم، هەستاو سەری ماچ کرد، خوا لە هەموویان خۆشببێ بەراستی ئایینی خوا کەڵە پیاوانی ئاوا لێهاتوو نەبەز پاراستویانەو ئابەو شێوە تەواو پاکە بە ئێمە یان گەیاندوە بەڵام بەداخەوە ئەی ئێمە چیمان لێ کرد؟! **(إلى الـ المُشتكى)** بۆ خراپی وەزعمان ودووری لەئاینمان.

بەڵێ ئەوانەی کە دڵیان خۆشە بەبێدینی بەر نەفرینو ڕقی خودا کەوتن چونکە،

(١٠٧) ئەوانە ژیانی دنیایان پێ خۆشەو هەڵیان بژاردوە بەسەر ژیانی دوا ڕۆژداو کافر بوون خۆ بێگومان خوایش ڕێنمای گەلی بێباوەڕو کافران ناکاتو نایان گەیەنێتە بەهەشتو خۆشبەختی،

(١٠٨) جا ئەوانە کەسانێکن کە خوا دڵەکانیانوگوێکانیان وچاوەکانیانی مۆر کردوەو حەق وراستی وەرناگرنو نایبیسنو نایبینن، هەرچەند خاوەن دڵو گوێ وچاویشبن بەڵام وەك شێتو کەرو کوێر وانو ئەوانە کەسانێکن کە بێ ئاگانو لەبێ ئاگای

خۆیان سەریان لێشێواوە وەك کابرای مەستو سەرخۆش نازانن چی ڕووئەدات لە چواردەوریاندا هەتا لەم ژیانەدا دەر دەچن.

(١٠٩) شتێکی حەقو نە گۆڕاوە کە ئەوانە لە ڕۆژی دوایدا لەریزی زیان لێ کەوتو ڕەنجەڕۆیانن. بەڵێ پاش باسی خراپانو سزاکانیان باسی پیاو چاکانو پاداشتەکانیان دەکات ودەفەرموێ:

(١١٠) لەپاش ئەوەی کەپاداشی کافرانتان زانی بزانن بەراستی خوای تۆ بۆ ئەو کەسانەی کە کۆچ ئەکەن لەبەر خاتری خوا دوای ئەوە کە توشی ئێشو ئازار بوون لەپاش ئەوەش دەست بەجیهاد ئەکەنو کۆڵ نادەنو خۆیان ناشارنەوەو خۆ ئەگەرن لەسەر ئەو ئێشو ئازارەی کەدێتە ڕێگایان خوا لە تاوانیان خۆش ئەبێ چونکە بەراستی خوای تۆ دوای ئەوئیشە جوانو بە نرخانە زۆر لێبوردەو میهرەبانە بەرامبەر بەبەندە چاکەکانیو پاداشی چاکیان پێ ئەدات. عیکرەمە لەعەبدوڵای کوڕی عەباسەوە هێناویەتی کە تاقمێك لەخەڵکی بەنهێنی موسڵمان بوونو لەروداوی بەدردا کەبت پەرستەکان هێنا بوونیان هەندێکیان بریندار بوونو هەندێکیشیان کوژران، جا موسڵمانەکان وتیان: ئەوانە برایانی ئێمە بونو موسڵمان بون، داوای لێخۆشبونیان بۆکردن، جا ئایەتی ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡۖ قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴾ النساء: ٩٧ دابەزی جا ئەم ئایەتە نوسرا بۆ ئەوانەی کە مابوونەوە لە(**مەکە**)دا کە بەهانە نەما، ئینجا ئەوانیش دەرچون بەرەو مەدینەو بت پەرستان پێیان گەیشتن دیسان بەرەو بت پەرستان گەڕانەوە جا ئایەتی ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ العنكبوت: ١٠ دابەزی جاموسڵمانان ئەمەیشیان بۆنوسین ئینجا بەنائومێدی لەهەمو چاکەیەك بەرەو مەدینە دەرچون لەپاشان ئەم ئایەتەی بەردەستمان دابەزی: ﴿ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ...... ﴾ جاموسڵمانان بۆیان نوسین کە خوا دەرگای ڕەحمەتی حۆی لێکردنەوە، جا لەکاتی دەرچونیاندا بت پەرستان هاتنە ڕێگایانو بەشەڕ هاتن هەندێکیان ڕزگار بونو هەندێکیشیان شەهید بون.

(١١١) لەو ڕۆژەدا کەوا هەمو کەسێك تەناتەت پێغەمبەرانیش جگە لە پێغەمبەرمان ﷺداوای ڕزگار بونی نەفسی خۆی دەکاتو

كەسی تری لەبیرا نامێنێ ئەوەندە ڕۆژێکی سەختو گرانە، وەهەمو کەسێك چی کردوە لەچاكو خراپ پاداشەکەی بەتەواوی پێ ئەدرێت(ئەگەر خۆی بەتاڵی نەکربێتەوە) وە ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت.

(١١٢) جا خوا وێنە دەهێنێتەوە بەشارێك یان دێهاتێك کە بێ ترس لە ئەمنو ئاسایشدا بژینو ڕوزی زۆرو فرەوانی بۆ بێت لەهەمو لایەکەوەو بۆ هیچ شتێك دانەمێنێن کەچی خەڵکی ئەو جێگایە ناسوپاسی خوا بکەنو ئەم هەمو نیعمەتانەیان بە هیچ نەزانن، لەبەر ئەوە خوای باڵادەست بەرگی برسێتیو ترسی کردوەتە بەریان بەبۆنەی ئەو ئیشانەی کە دەیانکرد، ئەم وێنەیە هی خەڵکی مەکە بو کە خەڵکی زۆر ڕێزی لێ ئەگەرتن لەسەر بونی ئەو ماڵەی خواو لەهەمو لایەکەوە بەلێشاوی نیعمەتی خوایان بۆ ئەهاتو هەرلە خۆیان خودا پێغەمبەریشی بۆناردن کەچی ئەوان نمەك نەناس بونو دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەیان کردو پێغەمبەریانﷺلەو شارە پیرۆزە دەرکردو پێغەمبەریش ﷺدوعای لێ کردن فەرموی: { اللّهم اشدُدْ وطأتكَ على مُضَرَ؛ اللّهم اجْعَلها عَلَيْهِمْ سِنِيَ كَسِنِي يُوسُفَ/ متفق عليه/ ئەی خوایە سزای خۆت توند بکەیت لەسەر قورەیشو ساڵانێکی وەك ساڵەکانی یوسف بدەیت بەسەریاندا}

بەڵێ خەڵکی لەمەکەدا لە جیاتی ئەوەی لەهەموکەس چاکترو زیاتر بەدەم پێغەمبەرەوە بهاتنایە چونکە خوا ڕێزی بەوان دابو کەچی ئەیان وت: ئەگەر ئێمە بەگوێی تۆ بکەین هەمو خەڵك پەلامارمان ئەدەنێو لەناومان ئەبەن، وە چەندین ستەمیان لە پێغەمبەرﷺ و موسڵمانەکان کردو پاشان خوا توشی قاتو قڕی کردن، ئەگەر چی ئەم سورەتە لەمەکەدا هاتوەو پێغەمبەرمان کاتێ هاتوتە مەدینە ئەم دوعایەی لێ کردون ئەگونجێ لەو کاتەدا کەئەم ئایەتە هاتوەتە خوارەوە اللّٰه وەك وێنەیەك باسی کردوە بۆ قورەیشو لەپاشدا ماناکەی لەخوایاندا هاتوەتە دی یان ئەم ئایەتە لەپاش ئەو دوعایەی پێغەمبەرﷺدابەزی بێت، والله اعلم.

(١١٣) خۆ بەراستی هاتەلای ئەوان نێرراوێك لە خۆیان کە محمدی ﷺکوڕی عەبدوڵا بوو چاکیان ئەناسیو بە ژیرو دەمو دەست پاكو بەناوبانگ بو(محمدالامین) لەناویاندا کەچی کاتێ وتی پێغەمبەرم ئەوان بەدرۆیان خستەوەو باوەڕیان پێ نەکرد!! جا لەبەر ئەوە سزای خوایان پێگەیشت، ئەوە بو لە بەدردا ئەو حەفتا کەسە بەناوبانگەیان لەناوچوو کە ئەبوجهل یەکێك بو لەوان وحەفتایشیان بەدیل گیرا، چونکەئەوان ستەمکار بون. ئینجا خوای میهرەبان دەفەرموێ

(١١٤) جا لەو حەڵاڵو پاکەی کەاللّٰه کردویەتی بەڕۆزیتان بخۆنوسوپاسی نیعمەتی اللّٰه بکەن ئەگەر ئێوە تەنها ئەو ئەپەرستن. لێرە وادەرئەکەوێت کە شتەحەڵاڵەکان پاکنو شتە قەدەغەکراوەکان پیسن چونکە خوا لەتاریفی پێغەمبەرماندﷺا فەرمویەتی: هەمو پاکەکانی بۆ ڕەواو حەڵاڵ کردون، وە هەمو پیسەکانی لێ قەدەغەکردون.

(١١٥) خوای میهرەبان ئەوەی کە حەرامی کردوە لێتان تەنها مردارە بوەو خوێنو گۆشتی بەرازەو ئەوەش کە سەر ئەبڕێت بۆ غەیری خواو مەبەستێکی تری تێکەڵ ئەبێ، ئاشکرایە کەخوای میهرەبان هەمو بارو دۆخەکانی ژیانی مرۆڤی لەبەرچاوگرتوەوهەرکەسێ ناچارکرا بەو مەرجەی خۆی مەبەستی ستەم نەبێ ولە سنوریش تێ نەپەڕێ ئەگەر لەوانە بخوات تاوانی ناگات وخوا حیسابی لەسەر ناکات، ئەوسا بێگومان کە اللّٰه زۆر لێخۆشبوو بەرەحمە بەرامبەر ئەوکەسانەی کەناچار ئەکرێن بۆ خواردنی ئەوشتە قەدەغەکراوانە، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١١٦) جا با لە خۆتانەوە هەروا بەدەم بەدرۆوە نەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە بەدڵنیاییەوە کە ئێوە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن، جا بێگومان ئەوانەی کە درۆ بەدەم خواوە هەڵدەبەستن قەت ڕزگار نابن. واتە: موسڵمان ئەبێ هیچ یاساو بڕیارێك دانەنێت لە خۆیەوە بەڵکو ئەبێ هەمو ئیشو کارو قسەو بڕیارێکی بەگوێرەی شەرعی خودا بێت، ئەگینا بیدعەچیو تاوانبارە.

(١١٧) تەنها ڕابواردنێکی کەمە لەم ژیانەدا ئەوسا بۆ ئەوان لەئاییندەدا سزایەکی دەردناك هەیە.

(١١٨) جا لەسەر ئەو کەسانەی کە جولەکە بون حەراممان کرد لێیان ئەوەی کەلە پێشەوە باسمان کرد بۆت، وە ئێمە ستەممان لێ نەکردون بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردوە. باسی ئەوشتەی کەلەسەریان قەدەغە کراوە لە ئایەتی سەدوچلوشەشی سورەتی ئەنعام دا هاتوە، لێرەدا مەبەست ئەوشتە قەدەغە کراوانەیە کە لە سورەتەکانی مەکەدا هاتوە. والله اعلم.

(١١٩) پاشان بزانە بێگومان خوای تۆ لەو کەسانەی کە بەنەزانی کرداری خراپیان کردوەو هاوبەشیان بۆ خوا داناوە پاش ئەوە گەڕانەوەو تەوبەیان کردوەو لەکرداری خۆیان پەشیمان بوونەوەوئیشی چاکیان ئەنجام دا، بێگومان پەروەردگارت لەدوای

ئەو کردارە خراپانەیان زۆر لێخۆش بوو بەسۆزەو چاوپۆشیان لێ ئەکاتو لێیان خۆش ئەبێت.

(١٢٠) بەراستی ئیبراهیم ﷺ خۆی بەتەنهایی یەك گەل بو کەگەردنکەچ بو بۆ ﷲ و لە هەمو ڕێگەیەکی ناڕەواو بێ سود لای دابوو بەرەو ڕێگای حەقو ئەو لەموشریکان نەبو ،

(١٢١) ئەوسوپاسگوزار بو لەسەر نیعمەتەکانی خواو خوایش هەڵیبژاردو کردی بەپێغەمبەرو ڕێنمای کرد بو ڕێگای ڕاست کە یەکخوا پەرستیو بەرنامەی پەروەردگاری عالەمە،

(١٢٢) جالە دنیادا شتی چاکمان پێدا لە منداڵی باشو شۆرەتی جوانو هاوتا کردنی لەگەڵ پێغەمبەرمان دا لە سەڵاوات لێدان دا کە سەڵاواتی ئیبراهیمی لە هەمو سەڵاواتەکانی تر ڕاسترو چاکترە کە (اللهُم صل عَلى مُحَمد وَعَلى آل مُحَمد كَمَا صليت عَلى إبْرَاهِيم و آل إِبْرَاهِيم، وَبارك عَلى مُحَمد وَعَلى آل مُحَمد كَمَا باركت عَلى إبْرَاهِيم و آل إبْرَاهِيم فِي العَا إنك يد يد ) یەکێکە لەو جۆرە سەڵاواتە ئیبراهیمیانەو موسڵمان هەمیشە لە تەحیاتەکانی نوێژدا ئەیخوێنێت، سەرەرای ئەو چاکانەی کەلەدنیادا بەو بەرێزە دراوە لە ڕۆژی دوایشدا لەریزی پیاو چاكو ساڵحاندایە.

(١٢٣) لەپاشان وەحیمان کردە لای تۆ ئەی محمدﷺکە تۆش پەیرەوی ئاینی ئیبراهیم بی لە عەقیدەدا کە ئەو ئیبراهیمە لای دابو لە هەمو شتێکی بێ کەڵكو بەتاڵو روبەحەق بوەوئەو لە موشریکان نەبوە. جارێکی تر ئەچێتەوە سەر باسی جولەکەو دەفەرموێ:

(١٢٤) ڕۆژی شەممە هەرلە سەر کەسانێك دانرا کە نارێکبون لەبارەی ڕۆژی جومعەوەوبێگومان پەروەردگارت لەرۆژی قیامەتدا لەنێوان ئەواندا لەبارەی ئەوشتەی کەئەوان نارێکن تێیدا بریاری خۆی دەدات، بۆ یاخی بوانو گومراهان سزاو بۆ پارێزکارانو چاکانیش پاداشت. واتە: ڕۆژی جومعە دانرا بۆیان کەتێیدا بحەسێنەوەو ئیش نەکەن ئەوان شەممەیان داناو جومعەیان لەبیر خۆیان بردەوە وەك پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ:{ إن اللهَ كَتبَ الْجُمُعَةَ عَلى مَنْ قبْلنَا فَاخْتَلفُوا فِيهَا وَهَدَانا اللهُ لَهَا فَالناسُ لَنا فِيهَا تَبعٌ غَدًا لِلْيهُودِ وَبَعْدَ غَدٍ لِلنصَارَى /البخاري ومسلم/ بێگومان کەخوا ڕۆژی جومعەی فەرزکرد لەسەر ئەو کەسانەی کە لە پێش ئێمەدا بوون جا ئەوان نارێکیان تێدا کردو خوا ڕێنمای ئێمەی بۆ ئەو ڕۆژە کردو ئەوخەڵکە لەو ڕۆژەدا بەدوای ئێمەدا دێن، جولەکە شەممەیان داناو گاوریش یەك شەممە} بەم شێوە ﷲ ئەم گەلەی ڕێنمای کرد بۆ ئەو ڕۆژە پیرۆزەو دەمان ترسێنێ لەوەی

ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾ إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرٗا لِّأَنۡعُمِهِۚ ٱجۡتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُ فِي ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٗۖ وَإِنَّهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبۡتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنۡ عَاقَبۡتُمۡ فَعَاقِبُواْ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبۡتُم بِهِۦۖ وَلَئِن صَبَرۡتُمۡ لَهُوَ خَيۡرٞ لِّلصَّٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصۡبِرۡ وَمَا صَبۡرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُ فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحۡسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

کەئێمەش وەك ئەوان لەبیری خۆمانی ببەینەوە، بەداخەوە کەئیستا والە هەندێ وڵاتی ئیسلامیدا نزیکە لەبیر ببرێتەوە ڕۆژی گومراهانو لەخوایاخیان کراوە بە ڕۆژی حەسانەوە؟!

(١٢٥) بانگ بکە بۆ ڕێگای پەروەردگارت ئەورێگاو ڕێبازەی کە پێت سپێرراوە بەژیرانەو دانایانە وبە ئامۆژگاری جوانو بەوشەی شیرینو موجادەلەیان لەگەڵدا بکە بە وشەیەکی چاك ترو جوانتر بێگومان کە پەروەردگارت زاناو عالە بەو کەسەی کەلای داوە لەرێگای ئەو، وەهەر خۆی زاناترە بەوکەسەی کەرێگای ڕاستی گرتوەو لە ریزی ڕێنمای کراوانە، ئەمە ئامۆژگارییەکە بۆ هەمو بانگەوازکەرانی ڕێگای ئیسلام لەهەمو سەردەمێکدا ئەبێ بزانن کە بانگ بۆخوا دەکەن نە بۆ خۆیانو خێڵوعەشرەتیان پاداشیان لەلای ئەوە نەك لەلای خەڵكو سەرەنجام هەر ڕاستی سەردەکەوێت بادەیان کۆسپ پیلانیش بخرێتە ڕێگای. دەڵێن کاتێ پێغەمبەری خوا لەغەزای ئوحودا چاوی بەحەمزەی مامی کەوت کە ناشیرین کرا بو فەرموی: ئەبێ حەفتا کەس لەوان وەك حەمزە پێ بکەم بەلاْم ﷲ ئەم ئایەتەی ناردو فەرموی:

(١٢٦) جا ئەگەر تۆڵەتان سەند ئەبێ تۆڵە وەك یەك بێ نابێ زیاتر بێ، وە ئەگەر خۆبگرنو تۆڵەنەسێنن هەر ئەوە بەسودترە بۆ خۆگران، واتە: ڕێگای نەدا لەتۆڵە سەندندا لە یەکسانی دەربچیت با لەکافرانیش بێت، ئەوەیە دادگەری ئیسلام

سُورَةُ الإِسۡرَاءِ ١٧ — ١١١

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١﴾ وَءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ وَجَعَلۡنَٰهُ هُدٗى لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُواْ مِن دُونِي وَكِيلٗا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٍۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَبۡدٗا شَكُورٗا ﴿٣﴾ وَقَضَيۡنَآ إِلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ لَتُفۡسِدُنَّ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَّتَيۡنِ وَلَتَعۡلُنَّ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثۡنَا عَلَيۡكُمۡ عِبَادٗا لَّنَآ أُوْلِي بَأۡسٖ شَدِيدٖ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعۡدٗا مَّفۡعُولٗا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدۡنَا لَكُمُ ٱلۡكَرَّةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَمۡدَدۡنَٰكُم بِأَمۡوَٰلٖ وَبَنِينَ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ أَكۡثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنۡ أَحۡسَنتُمۡ أَحۡسَنتُمۡ لِأَنفُسِكُمۡۖ وَإِنۡ أَسَأۡتُمۡ فَلَهَاۚ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ لِيَسُـُٔواْ وُجُوهَكُمۡ وَلِيَدۡخُلُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٖ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوۡاْ تَتۡبِيرًا ﴿٧﴾

گەورەترین پاڵەوانی ئیسلامو گەورەی شەهیدانی بەهەشتو مامی پێغەمبەری خوا ﷺ شەهید دەكرێتو گاڵتە بەلاشەكەیشی دەكرێتو دەشێوێنرێتو بكوژیشی ئاشكرایە كەچی ماوە نادرێت لە تۆڵەی یەكسان شتێكی تر زیاتر بكرێت بەڵكو هەڵیشی ئەنێت كە چاوپۆشی بكات، بەراستی پێغەمبەریش ﷺ هەردووهەمیانی هەڵبژاردو بكوژیشی لەكاتی دەسەڵاتدا عەفو كرد، ئادەی لەغەیری موسڵمان لەم جیهانی دیموكراتیوماڤ مرۆڤەدا نمونەیەكی ئاوا بهێنن.

ئەم ئایەتە لەمەدینەدا هاتوەتە خوارەوەو لەم سورەتە مەكەییەدا بە فەرمانی پێغەمبەرمان ﷺ تۆمار كراوەو وێنەی ئەمە زۆرە لە قورئاندا كە سورەتی مەكیەو یەك یان زیاتر لە ئایەتێكی لەمەدینەدا هاتوون یان بەپێچەوانەوە، جا لەبەر ئەوەیە زانینی هۆی دابەزینی ئایەتەكان پێویستە بەتایبەت بۆ ئەو كەسانەی كەمانای قورئان ئەكەن تا بەهەڵەدا نەچن لەمانا كردندا،

﴿١٢٧﴾ جاخۆبگرە وخۆگرتنیشت هەر بە فەرمانی ﷲ یەو هەر ئەو زاتەیە یارمەتی تۆ ئەدات لەسەر توانایی خۆراگری، ئەو خۆگرتنەش ئەبێ ئەنجام بدرێ هەروەك چۆن داوای جیهادت لێ دەكات لێرە داوای خۆگرتنت لێ دەكات، ئەنجامدانی هەردووكیان لەجێگای خۆیاندا عیبادەتو خواناسیە وتۆ دڵت تەنگ نەبێت لەو فرو فێڵەی كەئەوان دەیكەن سەبارەت بەخۆتو پەیڕەوانی بەرنامەكەت،

﴿١٢٨﴾ چونكە بێگومان ﷲ لەگەڵ ئەو كەسانەدایە كەلە خوا دەترسنو تەقوایان هەیەو چاكەكارن. بەراستی ئەمە موژدەیەكی گەورەیە بۆ ئەوكەسانەی كە پارێزكارو چاكەكارن چونكە خوایان لەگەڵ دایەو هەركەسێكیش خوای لەگەڵ دا بێ چ باكی هەیە.

## ١٧ سورەتی ئیسرا ١١١

سورەتی ئیسرا كە بە سورەتی (**سبحان**)و سورەتی (بەنی ئسرائیلی)ش دەناسرێت، سورەتی حەفدەهەمی قورئانەو ،سەدو یانزە ئایەتە، لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوە ، وتراوە جگە لە چەند ئایەتێكی نەبێت. وەبەگوێرەی دابەزین وتراوە سورەتی پەنجاهەمەو پاش سورەتی (**القصص**) و پێش (**یونس**) دابەزیوە. دایكی باوەڕدان دەڵێت: {**كَانَ النبِي ﷺ لَا يَنَامُ حَتى يَقْرَأَ الزمَرَ وَبَنِي إِسْرَائِيلَ**/الترمذي، صححه الالباني/ واتە: پێغەمبەر ﷺ تا سورەتی زومەرو بەنی ئیسرائیلی نەخوێندایە نەدەخەوت.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ پاكو مونەزەهیو بێ عەیبی بۆ ئەو زاتەیە كە شەوڕەوی كرد بە بەندەی خۆی لە مزگەوتی مەكەوە بۆ ئەو مزگەوتەی بەیتولموقەدەسەی كە خۆیو جواردەورەكەیمان بە پیتو بەرەكەت كرد بە پێغەمبەرانی زۆرو ئاوو هەواوی چاكو بەروبوومی زۆر، جا ئەم شەوڕەوییەمان كرد بە محمد ﷺ تا لە نیشانە كانی گەورەییو زانایی خۆمانی پێشان بدەین، بێگومان راستی ئەوەیە كە ئەو زاتە زۆر بیسەرو بینەرە.

ئەم ئایەتە باس لەشەوڕەوی پێغمبەرمان ﷺ دەكات كە پێش هیجرت روی داوە، بەڵام لەسەر ئەوەی كە ئەم روداوە لە چ ساڵێك پێش هیجرتو چ مانگێك رووی داوە لە نێوان زانایاناندا بۆچونی جیاواز هەیە،

(**اسراء**) واتە: شەوڕەوی كردن لە مەكەوە بۆ بەیتولموقەدەس، میعراجیش رۆیشتنی پێغەمبەرمانە ﷺ لە بەیتولموقدەسەوە بۆ ئاسمان، لەم ئایەتەدا شەوڕەوی پێغەمبەر لە مەكە تا دەگاتە بەیتولموقەدەس باسكراوەو هەركەسێك ئینكاری بكات كافر دەبێت، وە میعراج واتە: پەیژە ، كە مەبەست پێی بەرز بونەوەی پێغەمبەرە ﷺ لە بەیتولموقەدەسەوە بۆ ئاسمانەكانە بەو پەیژەیە كە خوا دەزانێت چۆن بووە لە سورەتی نەجم دا بەم روداوە ئاماژە كراوەو حەدیسانێكی زۆریش باسیان لێوەكردوە ، جا ئەوەی كە حەدیسەكانی بەلاواز داناوەو هەندێ قسەی تێدا كردوە، وە بڕیاری كوفری لەسەر نەدراوە، بەڵام ئەوەی كە حەدیسەكانیان بەپلەی {سەحیح یا حەسەن} زانیوەو سەرەڕای ئەوەش ئینكاری بكات پێی كافر دەبێت والله اعلم.

وە دیارە ئەم رووداوە بەخەون نەبوە بەڵکو پێغەمبەر لە حاڵێکدا کە بەخەبەر بووە بە رۆحو لاشەوە ئەم سەفەرە گەورەیەی کردوە ، چونکە کاتێك کە خەڵکی مەکەی لەم رووداوە خەبەر کردەوە زۆریان پێ سەیر بوو ئینکاریان کرد، ئەگەر خەون بوایە ئەوندە جێی سەرسوڕمان نەدەبوو بە موعجیزەیش حیساب نەدەکرا، ئەم رووداوە بەکورتی بەم شێوەیەبو کە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ شەوێك لە ماڵی (ئومو هانیئی) ئامۆزای لە پەنای کەعبەدا خەوتبو بەهۆی جوبرەئیلەوە {بوراق}ی بۆ رەوانەکرا کەلە گوێدرێژ گەورەترو لە ئێستر بچوکترو سپی رەنگ بو هەر هەنگاوێکی بەئەندازەی برکردنی چاوی بوو پێغەمبەرانی پێشویش سواری ئەو بۆراقە بوون ، جا پێغەمبەری خوا ﷺ سواری بو تا گەیشتە بەیتولموقەددەس‌و بەستیەوە بەو جێگایەی کە پێغەمبەرانی پێش خۆی بەو جێگایانەوە بەستبویەوە، پێغەمبەر لە پاش دوو رکات نوێژ بە هاوڕێیەتی جوبرەئیل سەرکەوت بۆ ئاسمان تا گەیشتن بەدەرگای ئاسمانگی یەکەم ،جا دەرگای ئاسمانیان بۆکرایەوە لەو کاتەدا چاوی بە ئادەم کەوت بەخێرهاتنی کردو دوعای خێری بۆ کرد ، جا هەر بەم شێوەیە بەرەو ئاسمانەکانی ترچون‌و لە هەر ئاسمانێکدا چاوی دەکەوت بە پێغەمبەرانێك تا گەیشتنە ئاسمانی حەوتەم لەوێشەوە بەرەو پێشگای ﷲ رۆیشتو ﷲ وەحی کردەلای‌و هەر لەوێ پەنجا نوێژی لەسەر خۆی وئوممەتەکەی پێویست کرد بەڵام لەکاتی گەڕانەوەدا گەیشتە موساو باسەکەی بۆکرد موسا پێی وت: بگەڕێرەوە پێشگای ﷲو داوای سوك بوونی لێ بکە من لەناو کوڕانی یەعقوب دا بووم لەوە کەمترم لێ داواکردن نەیانکردو من چاکیان دەناسم، پێغەمبەریش ﷺ لای کردەوە لای جوبرەئیل وەك پرس پێ کردنێك وئەوییش وتی: ئەگەر ئارەزۆت لێ هەیە بگەڕێرەوە پێغەمبەریش گەڕایەوە پێشگای ﷲو داوای سوك بونی لێ کرد ﷲ کردی بە چل نوێژو گەڕانەوە تا هاتنەوە لای موساو باسە کەی لێ پرسییەوەو فەرموی: دە نوێژی کەم کردوەتەوە ،وتی: بگەڕیرەوە داوای سوکبوون بکە ئوممەتەکەت لاوازن توانای ئەنجامدانیان نیە ، جا چەند جار بەم شێوەیە ئەم وتو وێژەکرا تا ﷲ فەرموی ئەی محمد ئەوە کردم بە پێنج نوێژو هەرنوێژێك بە دە نوێژ حیساب دەکەم‌و چاکە یەك بە دەیە ، واتە: لای پەروەردگار هەر پەنجایە بەڵام لە سەر بەندەکان پێنج نوێژ پێویست کراوە ، ئینجا پێغەمبەری ئازیزمان هاتەوە ماڵی (ئومو هانیئ) هێشتا بەتەواوی رۆژ دەرنەکەوتبو. کە ئەمە معجیزەیەکی زۆر گەورەو گرنگو رێزلێنانێك بو بۆ پێغەمبەرمان‌و تاقی کردنەویەکیش بو بۆ هەمو خەڵك ، جا ئەوەی کە باوەڕداری راستەقینەبو ئیمانی زیاتر بو ، وە ئەوەش کە بێباوەڕ بو ئینکاری کردو باری خۆی قورستر کرد.

پەروەردگار پێغەمبەرمان لە بەرزترین و بەشکۆترین جێگاکاندا بە وەسفی بەندایەتی یادی لێدەکات‌و باسی دەکات وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا ﴾ یان لەمەقامی نیگا کردنە لایدا دەفەرموێ: ﴿ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَىٰ عَبۡدِهِۦ مَآ أَوۡحَىٰ ﴾ النجم: ١٠

یان لە مەقامی دەعوەو بانگەوازیدا دەفەرموێت: ﴿ وَأَنَّهُۥ لَمَّا قَامَ عَبۡدُ ٱللَّهِ يَدۡعُوهُ كَادُواْ يَكُونُونَ عَلَيۡهِ لِبَدٗا ﴾ الجن: ١٩

وەیان لە مەقامی بەرنگاری‌و بەرامبەری کردن (**التحدی**) دەفەرموێ: ﴿ وَإِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّمَّا نَزَّلۡنَا عَلَىٰ عَبۡدِنَا فَأۡتُواْ بِسُورَةٖ مِّن مِّثۡلِهِۦ وَٱدۡعُواْ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٢٣

واتە: ئەگەر چی محمدمان ﷺ بەو مەقامە بەرزانە گەیاندوە بەڵام ئەو هەر بەندەی ﷲیەو بەندایەتی ﷲیش گەورەترین پلەو پایەیە، جا دوا بەدوای ئەوەی باسی{اسراوميعراج}ی کرد باسی موسا پێغەمبەر دەکات، چونکە چونی موسایش بۆ کێوی تورو قسە کردنی لەگەڵ ﷲدا هاوشێوەی{اسراو ميعراج}ی پێغەمبەرمانە ﷺ ،جا دەفەرموێ:

(٢) ئەوسا ئێمە تەوراتمان دا بە موساو کردمان بەرێ پیشاندەر بۆ کوڕانی یەعقوب بۆ ئەوەی کە جگە لە من هیچ پشتیوانێك وەرنەگرن‌و تەنها من بکەن بە پشتیوانی خۆیان‌و تەنها بەندایەتی بۆ من بکەن.

(٣) ئەی وەچەی ئەوانەی کە ئێمە هەڵمان گرتن لەگەڵ نوح داو رزگارمان کردن، هاوبەش دانەنێن بۆ ﷲ و سوپاسگوزاربن هەروەك نوح، کە بەراستی نوح بەندەیەکی سوپاسگوزار بو. باسی نوح عليه السلام دەکات تا بخاتەوە بیرمان کە هەمومان نەوەی ئەولادەکانی ئەوین کە لەو کەشتیەدا رزگار یان بو.

(٤) خۆ وەحیمان کردە لای کوڕانی یەعقوب لەو پەڕاوەدا کە تەورات بو وتمان: ئێوە دووجار خراپە دەکەن لەسەر زەویداو زۆر بەرز دەبنەوەو دەسەڵاتێکی زۆر گەورە پەیدا دەکەن و لە یاسای ﷲ لائەدەن.

(٥) جا ئەو کاتەی کە بەڵێنی یەکەم هاتە جێ ئێمە بۆ سزادان‌و تۆڵە لێ سەندنتان بەندە گەلێکی زۆر ئازاو لێ هاتوی خۆمان رەوانە دەکەینە سەرتان ، جا ئەوان بۆ سوك کردنتان بە شوێن ئێوەدا بە ناو ماڵ و منداڵتاندا دەگەڕێن تا لەناوتان بەرن‌و بێ

عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْ ۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَا ۘ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَافِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّ هَٰذَا الْقُرْآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ الْمُؤْمِنِينَ الَّذِينَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحَاتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴿٩﴾ وَأَنَّ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ وَيَدْعُ الْإِنسَانُ بِالشَّرِّ دُعَاءَهُ بِالْخَيْرِ ۖ وَكَانَ الْإِنسَانُ عَجُولًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ آيَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَيْءٍ فَصَّلْنَاهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾ وَكُلَّ إِنسَانٍ أَلْزَمْنَاهُ طَائِرَهُ فِي عُنُقِهِ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ كِتَابًا يَلْقَاهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ اقْرَأْ كِتَابَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ مَّنِ اهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ وَإِذَا أَرَدْنَا أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا الْقَوْلُ فَدَمَّرْنَاهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ الْقُرُونِ مِن بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِ خَبِيرًا بَصِيرًا ﴿١٧﴾

نرخو سەرشۆڕتان بکەن ، وە ئەوە بەڵێنیکی جێبەجێ کراوە لەلایەن خواوەو بێگومان ئەو بەڵایە دێت بەسەرتاندا.

(٦) لە پاشان ئێمە هێزمان بە ئێوە دایەوەو رۆژگارمان بەسودی ئێوە چەرخاندو ماڵ و کوڕانمان بۆتان فرەوان کردو لە دوژمنانی خۆتان زۆرترمان کردن‌و پیاوی شەڕکەری زۆرترمان لێهەڵخستن کە لە هەموکاتێکدا ئامادەی جەنگ بن،

(٧) جا پاشان ئەگەر ئیشی چاکترو جوانترتان کردو سوپاسی ئێمەتان کردو ئەو نیعمەتانەتان بە شێوەی چاك بەکار هێنا بەڕاستی ئەوە چاکەتان لەگەڵ خۆتاندا کردووە بەسودی خۆتانە، وەئەگەر بێتو خراپە بکەن ئەوەش هەر بۆخۆتانەو خۆتان زیان دەکەن ، جا کاتێك زەمانی بەڵێنی دووهەمیش هات بەهۆی ئەوەی کە ئێوە دەستان بە خراپەو تاوان کردوە دوژمنتان بە سەردا زاڵ دەکات، تاکو روتان رەش بکەن‌و هەر چۆن یەکەم جار دوژمنەکانتان هاتنە ناو مزگەوتی بەیتولوقەدەسەوە ئەم جارەش بکەوێتە دەستیانەوەو بێنەوەناوی‌و دەستیان بەچی شتێکی بەرزوچاکدا گەیشت بەتەواوی لەناوەی بەرن‌و تەفروتونایی بکەن‌و داری بەسەر بەردەوە نەهێڵن. ئابەم شێوەیەالله جولەکەو باقی گەلانی تر دەترسێنێ لە سەر پێچی کردنی خۆی‌و داوایان لێ دەکات کە بیر بکەنەوەودەفەرموێ:

(٨) ئەگەر ئێوە چاکە بکەن‌و بەرەو پەروەردگاری خۆتان بگەڕێنەوەوە ئۆمێدی ئەوە دەکرێت کە پەروەردگارتان رەحمتان پێ بکات ، بەڵام ئەگەر دووبارە بگەڕێنەوە بۆ تاوان‌و خراپە ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ سەرشۆڕکردن‌و لەناوبردنتان، وە ئێمە بۆ بێباوەڕان دۆزەخمان کردوە بە بەندیخانەیان ،

(٩) بەڕاستی ئەم قورئانە مرۆڤ رێنمای دەکات بۆ ئەو باوەڕو کردارەی کە زۆر بەرزترو تەواوترەو هەرکەسێکیش بەڕاستی دەستی پێوە بگرێت‌و پەیڕەوی بکات بەڵگەی لە هەمو کەس تەواوترو بەهێزترو رێك وپێك ترە ، وە ئەم قورئانە بەو باوەڕدارانەی کە کرداری چاك دەکەن موژدە دەدات کە پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە.

(١٠) خۆ بەو کەسانەش کە باوەڕ بە ڕۆژی دوایی ناکەن موژدە دەدات کە ئامادەمان کردوە بۆیان سزایەکی دەردناك. ئینجا الله بەکورتی پێناسەیەکی مرۆڤ دەکات‌و دەفەرموێ:

(١١) جا خووڕەوشتی مرۆڤ وایە کە لەکاتی ناخۆشی‌و رق هەستاندا بەپەلە دوعای شەڕ لە خۆی‌و ماڵ ومنداڵی دەکات وەك چۆن دوعای خێریان بۆ دەکات بە بێ‌ئەوەی کە بیرێك لە ئەنجامەکەی بکاتەوە، ئەوسا مرۆڤ دروستکراوێکی بێ حەوسوڵەو بەپەلەیە. لەیەکێك لە غەزاکانی پێغەمبەردا ﷺ یەکێك لە هاوەڵانی وشترەکەی خۆی نەفرین کرد، جا پێغەمبەر ﷺ پرسیاری کرد کە کێ بو نەفرینی وشترەکی کرد؟ کاتێك کە ئەو پیاوە وتی: من بوم ئەی پێغەمبەر، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {**أَنْزِلْ عَنْهُ فَلَا تَصْحَبْنَا بِمَلْعُونٍ لَا تَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَمْوَالِكُمْ لَا تُوَافِقُوا مِنْ اللهِ سَاعَةً يُسْأَلُ فِيهَا عَطَاءٌ فَيَسْتَجِيبُ لَكُمْ**}./مسلم وغ ه/ واتە: لەسەر وشترەکەت دابەزە بە شتی نەفرین لێکراو هاوڕێیمان مەکە، دوعای شەڕ مەکەن نەلە خۆتان‌و نە لە منداڵتان‌و نە لە ماڵتان نەوەك ئەو دوعایە رێی لەو کاتە بکەوێت کەلای خوا داوای هەر بەخششێکی لێ بکرێ وەڵامتان دەداتەوە، جا دوعا شەڕەکەی ئێوەش وەرگیرێت}
جا با مرۆڤ هەوڵ بدات کە لە سەر نەفسی خۆی زاڵ بێت‌و بەپەلە نەبێت لە دوعای شەڕکردندا. ئینجا الله باسی هەندێك لە نیعمەتەکانی خۆی دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٢) بەڕاستی ئێمە شەوو ڕۆژمان کردوە بە دوو نیشانە لە سەر دەسەڵات‌و کاربەجێی خۆمان جا شەو کە یەك لە نیشانەکانە، تاریکمان کرد تا تێیدا بحەسێنەوە بەڵام نیشانەی رۆژمان رووناك کردووە کەبە ئاسانی شتی تێدا ببینرێت تا ئێوە لە ڕۆژدا بڕۆن کەسابەت بکەن‌و ئەوەی پەروەردگارتان دایناوە بۆتان بەدەستی بهێنن، وە تا ئێوە بەم دوو نیشانە لە ژمارەی ساڵەکان‌و حسابی کاتەکان ئاگاداربن، وە هەرشتێك کە پێویست بێت بۆ ئێوە تا لەم زەویدا هەن ئێمە لەم قورئانەدا بەشێوەیەکی جوان هەمو

پێداویستیەکانی ئێوەمان روون کردوەتەوەو درێژەمان پێداوە، جا ئیتر مرۆڤ بۆی نیەو رەوانیە کە یاسایەکی تر جگە لەم قورئانە بۆ خۆی هەڵبژێرێت چونکە ئەوەی کە دەبێت بەهۆی بەختەوەری وهیدایەتی لەم قورئانەدا بە شێوەیەکی نەك جوان‌و روون ، بەڵکو جوانترو روونتر باسی هەیە ئیتر چۆن رەوایە پشتگوێی بخات‌و وازی لێ بێنێت؟! جا پاش ئەمە دەفەرموێ:

(١٣) هەمو ئینسانێك کردەوەکانی لە چاك‌و خراپ دەی کەینەملی‌و لێی جیا نابێتەوەو هەمو کردەوەکانی تۆمار دەکرێت‌و بۆی دەکەین بەکیتابێك ئەوسا لە رۆژی قیامەتدا دەری دەهێنین‌و بە کراوەی دەدرێتەوە دەستی‌و پێیدەوترێت:

(١٤) پەڕاوی کردارکانی خۆت بخوێنەرەوەو بزانە چیت کردوە، بەسە کە ئەمرۆ تۆ خۆت موحاسەبەی خۆت بکەی، واتە : لە رۆژی قیامەتا هەمو کەسێ چی کردوە بۆی تۆمار کراوەو خۆی دەزانێ مافی چی هەیەو جێگای لەکوێیەو هەمو کەس دەتوانێ نامەی خۆی بخوێنێتەوە ، جا ئەمە بەو مانانیە کە موحاسەبە ناکرێن، ئینجا خوای باڵادەست دەفەرموێ:

(١٥) ئەو کەسەی کە ڕێگای هیدایەتی گرتوە بەڕاستی سودی هیدایەتەکە بۆ خۆیەتی وەهەرکەسیش گومڕاه بێت خراپی گومڕاهیەکەی لە سەر خۆیەتی‌و هیچ نەفسێکی گوناهبار باری نەفسێکی تر هەڵناگرێت‌و ئێمە سزای هیچ کەسێکیش نادەین هەتا نێرراوی خۆمان نەنێرینە لای‌وچاك‌وخراپی بۆڕۆشن نەکەینەوە، ئینجا خوای باڵا دەست دەفەرموێ:

(١٦)ئەوسا هەر کاتێ کە ویستمان ولاتێك لەناو ببەین فەرمان دەدەین بەسەر ئەوانەی کە دەوڵەمەندو سەرمایەدارن کە عیبادەتی خوا بکەن ، جا ئەوان لە جیاتی بەندایەتی‌و عیبادەت خراپەو تاوانی تێدا دەکەن یان مرۆڤە خۆشگوزەرانەکانی ئەو ولاتانە زۆر دەکەین یان فەرمانڕەوایی ئەوان دەدەینە دەست کەسانێك کە ئیشیان خۆشگوزەرانی‌و رابواردنە ، جا ئەو کاتە قسەی ئێمە لەسەر ئەوان دێتە دی کەستەمکارن‌و پێویستە تۆڵەیان لێ وەرگیرێت ئەوسا ئێمە ئەو ولاتە لەناو دەبەین‌و بە تەواوی وێران‌و کاولی دەکەین، بەڵام چ کاول کردنێك. واتە هەرکاتێك دەوڵەمەندو خۆشگوزەرانەکانی ولاتێك دەستیان کرد بەتاوان‌و خراپە ئەوە پەروەردگار دەیەوێت ئەو ولاتە لەناو بەرێت. ئینجا سرنجمان بۆ یەکێك لەو روداوە گرنگانەی کە رویان داوە لەناو گەلانی پێشودا رادەکێشێ‌و دەفەموێ:

(١٧) جا چەند زۆرن گەلانێك کە لە پاش نوح پێغەمبەر ﵇ لەناومان بردن کاتێك کەبەتەواوی رویان لە کوفرو تاوان کرد

مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعَاجِلَةَ عَجَّلۡنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلۡنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصۡلَىٰهَا مَذۡمُومٗا مَّدۡحُورٗا ﴿١٨﴾ وَمَنۡ أَرَادَ ٱلۡأٓخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعۡيَهَا وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعۡيُهُم مَّشۡكُورٗا ﴿١٩﴾ كُلّٗا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنۡ عَطَآءِ رَبِّكَۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحۡظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ فَضَّلۡنَا بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖۚ وَلَلۡأٓخِرَةُ أَكۡبَرُ دَرَجَٰتٖ وَأَكۡبَرُ تَفۡضِيلٗا ﴿٢١﴾ لَّا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَقۡعُدَ مَذۡمُومٗا مَّخۡذُولٗا ﴿٢٢﴾ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴿٢٣﴾ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمۡۚ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا ﴿٢٥﴾ وَءَاتِ ذَا ٱلۡقُرۡبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلۡمِسۡكِينَ وَٱبۡنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرۡ تَبۡذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخۡوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِۖ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورٗا ﴿٢٧﴾

وەك گەلی عادو سەمودو لووت، جا ئێوەش کە بەرێزترین پێغەمبەر بەدرۆ دەخەنەوە شایستەترن بەوەی کە سزا بدرێن، جا بەسە کە پەروەردگاری تۆ ئاگادار بێ بەسەر تاوانی بەندەکانیداو بینەری هەڵس‌و کەوتەکانیان بێت.

(١٨) ئەوسا ئەو کەسەی کە ژیانی ئیستای دنیای دەوێ‌و خۆی بۆ ئەوە تەرخان کردوەو بۆ ئەوە ئیش دەکات ئێمە بۆ هەر کەس لەوان کە ئارەزۆمان لێ بێت لە خۆشیەکانی دنیا ئەوەندەی کە ویستی ئێمەی لەسەر بێت پێی دەدەین، لەپاشان دۆزەخمان داناوە بۆئەوان کە بە لۆمە کراوی‌و دەرکراوی لە هەر سۆزو بەزەییەك دەچێتە ناویەوە. واتە مەرج نیە هەرکەسێ دنیایی بوێت اللّٰه پێی بدات بەڵام زۆربەی دنیا ویستان بەو ئەندازەی کە اللّٰه خۆی ویستی لەسەر بێت پێیدەبەخشێت.

(١٩) خۆ ئەو کەسەیش کە مەبەستی دوا ڕۆژەو بۆ ئەوە کۆشش دەکات بە کۆششێکی چالاکانەو دڵسۆزانە لە هەمان کاتدا باوەڕدارە بە پەروەردگاری جیهان‌و پەڕاوە ئاسمانیەکان‌و فریشتەکان‌و هەمو پێغەمبەران ئەوسا هەرئەوانەن کە کارو کۆششیان وەرگیراوو سوپاسکراوەو خوای میهرەبان پاداشتی چاکەکانیان بەچەند بەرامبەر دەداتەوە. لێرە پێویستە ئەوە بزانین کە کارو کۆششێك بۆ دوارۆژ بەسودەو وەردەگیرێت کە خاوەنەکەی باوەڕدار بێت‌و مەبەستی رەزامەندی پەروەردگار بێت‌و خۆهەڵنان‌و خۆدەرخستن‌و لە خۆبایی بونی تێدا نەبێ‌و ڕێکبێ

لەگەڵ قورئان‌وفەرمودەکانی پێغەمبەردا ﷺ ، جا ئەمانە ئەگەر چی مەبەستیان دوارۆژە بەلاَم لە ژیانی دنیاش بێ بەهرە نین.

(٢٠) بەڵکو ئێمە لە بەخششی پەروەردگارت بژێوی‌و نیعمەتی خۆمان لە دنیادا دەدەین بە هەمو کەس، بە کافرو موسڵمان، وە بەخششی پەروەردگارت لە دنیادا لەکەس قەدەغە ناکرێت بە بۆنەی کوفرەوە، چونکە الله ڕەحمانەو بەندەکانی خۆی نائومید ناکات‌و هەرچی دروستکردوە بەندەی ئەون کافر بێت یان موسڵمان تا هەردوولا ئەو ڕێگایەی کە هەڵیان بژاردوە بتوانن بیبەنە سەر.

(٢١) تەماشا بکەن وبزانن چۆن هەندێکمان بەرزکردوە بەسەر هەندێکی تردا لەژیانی دنیادا لە پلەو ناوبانگداو لە جوانی وناشرینیداو لە تەمەنولە درێژی‌و کورتیدا کەخۆتان بەچاوی خۆتان ئەم جیاوازیانە دەبینن، دەی بزانن بەڕاستی لەڕۆژی دوایدا پلەو پایەکان گەورەترن‌و جیاوازی نیوان پلەو پایەکانی دوارۆژ زۆر ئاشکراترو گەورەترن لە ئەوەی دنیا، پێغەمبەر ﷺ لە وەسفی جیاوازی نێوان پلەو پایەی بەهەشتیەکاندا دەفەرموێ: {إن أَهْلَ الجَنةِ يَتَراءَوْنَ أَهْلَ الغُرَفِ مِنْ فَوْقِهِمْ كَمَا يَتَراءَوْنَ الكَوْكَبَ الدري الغَابِرَ فِي الأُفُقِ مِنْ المَشْرِقِ أَوْ المَغْرِبِ لِتَفَاضُلِ مَا بَيْنَهُمْ قَالُوا يَا رَسُولَ اللهِ تِلْكَ مَنَازِلُ الأَنْبِيَاءِ لَا يَبْلُغُهَا غَيْرُهُمْ قَالَ بَلَى وَالذِي نَفْسِي بِيَدِهِ رِجَالٌ آمَنُوا بِاللهِ وَصَدقُوا المُرْسَلِ- /متفق عليه/ واتە: بەهەشتیەکان بە هۆی جیاوازی پلەوپایەیانەوە شوێنی خاوەن بالاَخانەکانی بەهەشت کە لە سەرەوەی خۆیانەوەن دەبینن هەر چۆنێك کە ئەستێرەی پرشنگ دار دەبینن کە لەوپەڕی ئاسۆی ڕۆژهەڵهات یان ڕۆژئاوادا خەریکە دەڕواتو نامێنێت. وتمان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو شوێنە بەرزانە جێگای پێغەمبەرانە کە جگە لەوان هیچ کەس پێی ناگات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: نەخێر وانیە، سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بە دەستە پیاوانێك کە باوەڕیان بە الله هێناوەو هەمو پێغەمبەرانیشان بە ڕاست زانیوە بەو پلەو پایە بەرزانە دەگەن.} جا کەوابو بۆ دوارۆژتان هەوڵ بدەن چونکە هەرئەوە بەسوودەو دەمێنێتەوە.

(٢٢) نەکەی لەگەڵ الله دا هیچ پەرستراوێکی تر دابنێیت‌و جگە لەو زاتە بەندایەتی بۆ کەس نەکەیت، چونکە ئەگەر واتکرد تۆ دەست بە ئەژنۆو لۆمەکراوو دۆڕاوو سوك کراو دادەنیشی‌و یارمەتی دەرێکت بۆ نییەو سەربەرزو کەیفخۆش نابیت، بەڵێ: بەندایەتی پاك‌و خاوێن پیشەی خواپەرستانی ڕاستەقینەیەو مرۆڤ بۆ ئەمە هاتوەتە ئەم جیهانە، جا لەبەر ئەوە دەبینی باسی هاوبەشی دانان بۆ پەروەردگارو سزای ئەوانەی کە ئەو تاوانە گەورە دەکەن لە قورئاندا زۆر هاتوە بەتایبەت لە سورەتە مەککەییەکاندا ئەوەتە لێرە تا ئێستا چەند جار بە شێوەی جیاجیا باسی خراپی بت پەرستی وهاوبەشدانانی کردو جارێکی تر لەگەڵ باسکردنی کۆمەڵێکی زۆر لە تاوانەکان دەچێتەوە سەری‌و دەفەرموێ:

(٢٣) پەروەردگاری تۆ وای فەرمانداوە کە ئێوە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن، وە لەگەڵ دایك‌و باوکتاندا چاکە بکەن ئەگەر یەکێك لەوان یان هەردووکیان بە پیری مانەوە لەلات ئەوسا تۆ لەڕوی ئەواندا بچوك ترین وشەی ناشیرین بەکار مەهێنەو ڕوویان لێ گرژ مەکەو قسەی ڕەقیان لەگەڵدا مەکە، وە هەمیشە بەقسەیەکی جوان‌و بەڕێزەوە لەگەڵیاندا قسە بکە.

(٢٤) جا باڵی زەلیلی خۆتیان بۆ رابخەو هەمیشە بەسۆزو بە میهرەبانیەوە هەڵس وکەوتیان لەگەڵدا بکەو دوعای خێریان بۆ بکەو بڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕەحمیان پێ بکە وەك چۆن ئەوان ڕەحمیان بەمن کردوەو بە منداڵی پەروەردەیان کردوم. پەروەردگار لەم ئایەتانەدا لە دوای باسکردنی مافی خۆی بەسەر بەندەکانییەوە کە بەندایەتی کردن‌و دانەنانی هاوەڵە بۆی باس لە مافی دایك‌و باوك دەکات‌و پێویستی دەکات کە هەم بە کردارو هەم بە قسە بە جوانی ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن‌و ئازاریان نەدەن‌و دوعای خەیران بۆ بکەن بە تایبەت کاتێك کە پیرو کەساس دەبن‌و چاوەڕوانی چاکەن کە لەگەڵیاندا بکرێت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: { رِضَا الرب فِي رِضَا الوَالِدَيْنِ وَسَخَطُهُ فِي سَخَطِهِمَا./الط ا ، صحح الالبا / واتە: ڕەزامەندی پەروەردگار لە ڕەزامەندی دایك‌و باوك دایە، وە ڕق‌و قینی پەروەردگار لە نارەزای ئەواندایە}.

(٢٥) پەروەردگارتان ئاگادارە بەوەی کە لە دڵتاندایە ئەگەر ئێوە بۆ ڕەزامەندی الله بە دڵسۆزی ودڵپاکیەوە خزمەتی باوك ودایکتان بکەن بێگومان الله لە تاوانی ئەو کەسانەی کە دڵسۆزی باوك ودایکیانن‌و لە تاوانەکانیان پەشیمانن‌و هەمیشە بەرەو لای الله دەگەڕێنەوە زۆر لێخۆشبوو چاوپۆشی کەرە، ئینجا دوا بەدوای مافی دایك وباوك دەفەرموێ:

(٢٦) ببەخشە بەوانەی کە خزمی نزیکتن ئەوەی کە مافی خۆیانە وببەخشە بە هەژاران‌و ڕێبواران ونەکەی ماڵ بە بێهودە خەرج بکەیت،

(٢٧) چونکە بەڕاستی ئەوانەی کەماڵ بە بێهودە خەرج دەکەن برایانی شەیتانن، خۆ شەیتانیش کافرە بە نیعمەتەکانی پەروەردگاری خۆی، شەیتان هەوڵدەدات کە مرۆڤ بەخیل‌و دەست قوچاو بکات، جا ئەگەر بۆی نەکرا هەوڵدەدات بیکات بە

مرۆڤێکی موسریفو هەڵەخەرج و ئەوماڵەی کە خوا پێیداوە لە شتی خراپو بێ هودەدا خەرج بکات. زۆرێ لەتەفسیر نوسان وشەی{ تَبۡذِيرًا }یان وەك {إسراف} مانا کردوە هەر چەند دەگونجێ هەردوو یەك مانایان هەبێ بەلأم من وای بۆ دەچم کە {تَبۡذِيرًا } لەناوبردنی ماڵە بەشێوەیەك کە نەخۆتو نەخەڵك سودی لێ وەرنەگرێت، چونکە ئەمە لە ئیشی شەیتان دەچێت چونکەئیشەکانی نەبۆ خۆیو نە بۆخەڵك سودی نیە واللّه اعلم.

جا دەفەرموێ:

(٢٨) جا ئەگەر پشتت لەوان کرد بە چاوەڕێی دەست کەوتنی نیعمەتێکی پەروەردگارتەوەو ئیستا هیچت لە دەستدا نییە دەی ئەوکاتە قسەی دڵخۆشکەرو هیوا بەخش‌وئاسانیان لەگەلدا بکەو دوعای زۆر بونی رزقیان بۆ بکەو بەڵێنیان پێ بدە هەر کاتێ بووم یارمەتیتان دەدەم.

(٢٩) رەزیل وڕژد مەبە وەك ئەوەی کەدەستت بەستبێ بە ملتەوەنەگاتە باخەڵت، وە بەتەواویش دەست بلأونەکەیتەوە کە هەرچیت هەیە بیبەخشیتو لەپاشان لەبەر نەبونی پەکت بکەوێت وسەرکۆنەکراوو پەك کەوتوو دابڕاو بیت لەهەموشت.

(٣٠) بەڕاستی پەروەردگارت بۆ ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت رۆزی بۆ فرەوان دەکاتو تەنگیشی دەکاتەوە لەو کەسەی کە ئارەزۆ لێ بێ، بێگومان ئەو زاتە ئاگاداری ژیانی بەندەکانیەتیو بینەری رەفتارو کردارو چۆن ماڵ پەیدا کردن وچۆن خەرج کردنێەتی ودەزانێ کە ئایا کەمدەستی بەسودێتی یان دەستپڕی کە هەردوو بۆ تاقی کردنەوەنو هەرکەسەی بە یەکێکیان تاقی دەکاتەوە پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ:{ إن اللهَ قالَ لِي أنفِقْ أُنفِقْ عَلَيْكَ/مسلم وغ ه/ بێگومانﷲبە منی فەرمو: ببەخشە پێت دەبەخشم}. بەڵێ ﷲ خۆی بەندەکانی خۆی دەبینێو بێ ئاگا نییە لە بارودۆخی ژیانیان بەلأم دەیەوێت هەندێکی بە هەندێکی تاقی بکاتەوە، وە لێرەش هەڕەشەیەکی توند دەکات لەو کەسانەی کە منداڵی خۆیان لەبەر ترس لەکەمدەستیو هەژاری دەکوژنو دەفەرموێ:

(٣١) ئەوسا منداڵەکانی خۆتان لە ترسی کەمدەستیو نەداری مەکوژن ئێمەین کەرزقی ئەوان وئێوەش دەدەین بەراستی کوشتنی ئەوان تاوانێکی گەورەیە. لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بەو پیاوو ژنەی کە بۆ ئەوەی منداڵیان نەبێت پیاوەکەی لە دەرەوەی ئەندامی زاوزێی ئافرەتەوە ئاوی خۆی دەرژێنێت ،واتە: (العزل) بە زیندوو بە چاڵکردنێکی نهێنی منداڵان ناوی بردوە وەك ئەو فەرمودەیەی کە مسلم روایەتی

وَإِمَّا تُعۡرِضَنَّ عَنۡهُمُ ٱبۡتِغَآءَ رَحۡمَةٖ مِّن رَّبِّكَ تَرۡجُوهَا فَقُل لَّهُمۡ قَوۡلٗا مَّيۡسُورٗا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرَۢا بَصِيرٗا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَوۡلَٰدَكُمۡ خَشۡيَةَ إِمۡلَٰقٖۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُهُمۡ وَإِيَّاكُمۡۚ إِنَّ قَتۡلَهُمۡ كَانَ خِطۡـٔٗا كَبِيرٗا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّۗ وَمَن قُتِلَ مَظۡلُومٗا فَقَدۡ جَعَلۡنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلۡطَٰنٗا فَلَا يُسۡرِف فِّي ٱلۡقَتۡلِۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورٗا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقۡرَبُواْ مَالَ ٱلۡيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ حَتَّىٰ يَبۡلُغَ أَشُدَّهُۥۚ وَأَوۡفُواْ بِٱلۡعَهۡدِۖ إِنَّ ٱلۡعَهۡدَ كَانَ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٤﴾ وَأَوۡفُواْ ٱلۡكَيۡلَ إِذَا كِلۡتُمۡ وَزِنُواْ بِٱلۡقِسۡطَاسِ ٱلۡمُسۡتَقِيمِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلٗا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌۚ إِنَّ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡبَصَرَ وَٱلۡفُؤَادَ كُلُّ أُوْلَٰٓئِكَ كَانَ عَنۡهُ مَسۡـُٔولٗا ﴿٣٦﴾ وَلَا تَمۡشِ فِي ٱلۡأَرۡضِ مَرَحًاۖ إِنَّكَ لَن تَخۡرِقَ ٱلۡأَرۡضَ وَلَن تَبۡلُغَ ٱلۡجِبَالَ طُولٗا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكۡرُوهٗا ﴿٣٨﴾

کردوە جا هەر لەبەر ئەوەی بەشێك لە زانایان پێیان وایە رێك خستنی زاوزێیو وەچە(تنظيم النسل) بە حەرام دەزانن بەلأم جا بیر دەگێڕێتەوەو دەڵێ: {كُنا نَعْزلُ عَلى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَبلَغَ ذَلِكَ نَ ـ اللهِ ﷺ فَلَمْ يَنْهَنَا/متفق عليه / ئێمە لە زەمانی پێغەمبەردا "عزل"مان دەکرد جا پێغەمبەرﷺ ئەوەی پێگەیشتبوو کە ئێمە وا دەکەین بەلأم پێغەمبەرﷺ بەرگری نەکردین}. جا بۆیە بیرورای زانایان لەم بارەوە جیاوازە، جا ئێمە ئەو بیروڕایەمان پێ‌راستە کە هەردوو بەش لە فەرمودەکان وەربگیرێتو ئێشی پێبکرێت ،جا بۆیە دەڵێین رێکوپێك خستنی وەچە(تنظيم النسل) بۆ کەسێك کە دەیەوێت لەو ماوەیەی کە شیر دەدات یان دکتوری موسڵمانی متمانە پێکراو ماوەیەك دانێت کە نابێت لەو ماوەدا باردار بێت بەهۆی هۆکارێکی شەرعییەوە وەك ئەو ئافرەتەی کە بە بێ‌عەمەلیاتو دڕینی سك منداڵی نەبێت یان ئەوەی کە پیاوو ئافرت رێك دەکەون لە گەڵ یەکدا بۆ ئەوەی کە ماوەیەك منداڵیان نەبێت ، وە ئەمەش بەهۆی بە هێز بونی ئەو بەلگەیانەن کە رەوا بونی عەزل دەگەیەننو هەروەها کرداری یارانی پێغەمبەریش. ئەگەرچی ئەگەر هۆیەکی شەرعی نەبێت وازلێهێنان لە ئەنجامدانی عەزلو ئەوەی کە وەك ئەو وایە چاکترە چونکە ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت:{ ذُكِرَ العَزْلُ عِنْدَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقالَ وَلِمَ يَفْعَلُ ذَلِكَ أحَدُكُمْ وَلَمْ يَقُلْ فَلا يَفْعَلْ ذَلِكَ أحَدُكُمْ فَإنَهُ لَيسَتْ نَفْسٌ مَخْلوقَةٌ إلا اللهُ خَالِقُهَا /متفق عليه/ باسی

عەزل کرا لە لای پێغەمبەر ﷺ جا ئەویش فەرمووی: ئەوە بۆ کەسانی ناو ئێوە ئەو ئیشە دەکەن؟ خۆنەی فەرمو: ئەوسا وانەکەن، جا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هیچ دروستکراوێك نیەکە بڕیاری دروستکردنی درا بێت بێگومان کە ﷲ دروستی دەکاتو بەهیچ شێوەیەك ڕێگری لێ ناکرێت. وە مەبەست لە ڕێکوپێك خستنی وەچە(تنظيم النسل) ئەوەیە کە بە هۆی بەکارهێنانی هۆکارانێکی شەرعییەوەکەنەبن بە هۆی زیان، بۆ ماوەیەك لە زەمان بەرگری بکرێت لە باردارببون، کە ئەمە جیاوازە لەگەڵ دیاری کردنی ژمارەدا( ديد النسل)کە ئەمەیان کردارێکی پەسەند نەکراووناڕەوایە. پاشان پەروەردگار دەفەرمووێ:

(٣٢) ئەوسا نزیکی زینا مەبنەوەو خۆتان لە هەمو ئەو شتانە بپارێزن کە ئێوە بۆ ئەو تاوانە گەورەیە رابکێشێت ، بەڕاستی ئەوە گوناهێکی ئاشکراو قەڵبەزەنەو خراپترین ڕێگایشە ئەو ڕێگایە جا بەو ڕێگایەدا مەچن. عەبدولای کوڕی مەسعود دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەرﷺ کە کام تاوان لە هەمو گەورترە؟ دەڵێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:{ أَنْ تَجْعَلَ لِلهِ نِدا وَهُوَ خَلَقَكَ قُلتُ ثم أي قَالَ ثم أنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أنْ يطعَمَ مَعَكَ قُلتُ ثم أي قَالَ أنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ/متفق عليه/ گەورەترین تاوان ئەوەیە کە تۆ هاوەڵ بۆ ﷲ دابنێیت لە حاڵێکدا کە ئەو تۆی دروستکردوە، وتم پاش ئەو چییە؟ فەرمووی: ئەوەی کە منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی کە خواردنت لەگەڵدا بخوات، وتم ئەی پاش ئەوە؟ فەرمووی: ئەوەیە کە لەگەڵ خێزانی دەراوسێکەتدا زینا بکەیت}

(٣٣) ئەوسا ئەو گیانانەی کەﷲ حەرامی کردوە مەکوژن مەگەر لەسەر مافێك بێت کە خوا دایناوە وەك ئەوەی کەسێ کەسێ بە ناڕەوا بکوژێت، یان پیاو یان ئافرەتێك کە هاوسەریان کرد بێ زینا بکەن، یان کەسێك لەئایین پاش گەزبیبێتەوە، وە هەر کەسێك بە ناڕەوا کوژرا بەڕاستی ئێمە بۆ تۆڵەسەندنەوەی هێزو دەسەلاتمان داوەتە دەست خاوەن کوژراوەکە کە نزیکترین میراتگرو خزمێتی، جا با ئەویش زیادەڕەوی نەکات لەکوشتن دا چونکە بەڕاستی ئەو یارمەتی دراو دەبێت لەلایەن یاسای خواو فەرمان ڕەوایانەوەو تۆڵەی بۆ وەرئەگەرنەوە ، جا ئەبێ ئەویش زیادە ڕەوی نەکاتو دەست درێژی نەکاتە سەر ئەوانەی کە بێ تاوانن. پێغەمبەرﷺدەفەرمووێ:{ لَنْ يَزَالَ الْمُؤْمِنُ فِي فُسْحَةٍ مِنْ دِينِهِ مَا لَمْ يُصِبْ دَمًا حَرَامًا/البخاري/ بەهەمیشە باوەڕدار لە دینەکەیدا بەربلاوی و فەرەوانی کردارە چاکەکانی بۆ دەرەخسێت مادامێك توشی خوێنی حەرام نەبێت}واتە باوەڕدار خوێنی حەرامی توشبو دنیایی لێ تەنگ دەبێتەوەو هەمیشە هەست بەدڵتەنگی‌وبێ دەرەتانی دەکات‌ونازانێ لەم دنیا فرەوانەدا چۆن هەڵس‌وکەوت دەکات.

(٣٤) ئەوسا نزیکی ماڵی هەتیو مەبنەوە مەگەر بەشێوەیەکی چاك و بۆ خزمەت کردنی ماڵە کەببێت واتە ئەو ماڵی هەتیوەی کە لای ئێوەیەو ئەتانەوێ خزمەتی بکەن وەك ئەوەی کاسبیو بازرگانی پێ بکرێت با لاتان بێت تا ئەو کاتەی کە ئەوان دەگەنە بەهێزی تەواوو باڵق دەبن، وە پەیمانەکانتان ببنە سەرو نەیشکێنن، چونکە بەڕاستی ئەو پەیمانە پرسیار لێ کراو دەبێ، ئایا جێ بەجێ کرابیت یانە نە، وەپەیمان شکێنی یەکێکە لە نیشانەی مونافقی بەڵکو ئەبێ بەهۆی نەمانی ئیمانیش، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرمووێ:{لَا إِيمَانَ لِمَنْ لَا أَمَانَةَ لَهُ وَلَا دِينَ لِمَنْ لَا عَهْدَ لَهُ/أ د، صحح الالبا / ئەوکەسەی کە ئەمانەتدارو دەست پاك نەبێت ئیمانی نییەو ئەو کەسەیش کە پەیمانەکانی نەداتەسەر دینی نییە}.

(٣٥) جا هەر کاتێك شتێکتان پێوا بە تەواوی بی پێون ، وە کێشانە بکەن بەمیزانێکی ڕاست وتەواو ئەوە ئەنجامێکی باشترو جوان تری بۆتان هەیە، چونکە ئەبێ بەمایەی سەربەرزی هەردوو ژیان. پێغەمبەر ﷺ ڕوی کردە هاوەڵانی کۆچەری و فەرمووی:{ يَا مَعْشَرَ الْمُهَاجِرِينَ خَمْسٌ إِذَا ابْتُلِيتُمْ بِهِنَّ وَأَعُوذُ بِاللهِ أَنْ تُدْرِكُوهُنَّ لَمْ تَظْهَرْ الْفَاحِشَةُ فِي قَوْمٍ قَط حَتى يُعْلِنُوا بِهَا إِلا فَشَا فِيهِمْ الطَّاعُونُ وَالْأَوْجَاعُ الَّتِي لَمْ تَكُنْ مَضَتْ فِي أَسْلَافِهِمْ الَّذِينَ مَضَوْا وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِلا أُخِذُوا بِالسنِينَ وَشِدةِ الْمَئُونَةِ وَجَوْرِ السلطَانِ عَلَيْهِمْ وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوَالِهِمْ إِلا مُنِعُوا الْقَطْرَ مِنْ السَّمَاءِ وَلَوْلَا الْبَهَائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا وَلَمْ يَنْقُضُوا عَهْدَ اللهِ وَعَهْدَ رَسُولِهِ إِلا سَلط اللهُ عَلَيْهِمْ عَدُوا مِنْ غَيْرِهِمْ فَأَخَذُوا بَعْضَ مَا فِي أَيْدِيهِمْ وَمَا لَمْ تَحْكُمْ أَئِمتُهُمْ بِكِتَابِ اللهِ وَيَتَخَيرُوا مِما أَنْزَلَ اللهُ إِلا جَعَلَ اللهُ بَأْسَهُمْ بَيْنَهُمْ./ابن ماجه، صححه الالبا / واتە: ئەی کۆمەڵی کۆچکەران پێنج بەڵا هەیە کە ئەگەر توشیبون، جا ئەو کاتە چاوەڕوانی سزا بن وە من پەنا دەگرم بە ﷲ کە ئێوە توشی ئەوانە ببن، زینا لە هیچ گەلێکدا پەرەی نەسەندووە ئاشکرا ببێت مەگەر لە ناو ئەواندا نەخۆشینی تاعونو ئێش گەلێك کە لە گەلانی رابردوویاندا نەبووە لە ناویاندا بڵاو بوبێتەوە، وە هیچ گەلێك پێوانەو کێشانەیان بۆ خەڵك کەم نەکردوەتەوە مەگەر دوچاری قاتوقڕیو گرانیو ستەمی دەسەڵاتدارن بەسەریاندا بووبن، وە بەرگریان لە زەکاتی ماڵی خۆیان نەکردوە مەگەر بارانیان لێ بەرگری کرابێت ، وە ئەگەر لەبەر بێزمانان نەبوایە بارانیان بۆ نەدەباری، وە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیان نەشکاندوە مەگەر ﷲ دوژمنێکی جگە لەخۆیانی زاڵ کرد بێت بەسەریانداو

هەندێك لەو سەروەتو سامانو هێزەی كە لە بەردەستیاندایە لە دەستی دەرهێناون، وە فەرمانڕەوایانیان بە پەیامەكەی الله حوكمیان نەكرد بێتو بە كەیفی خۆیان لەوەی كە خوا بۆی ناردون هەڵیان نەبژاردوە مەگەر خوا ئاژاوەو شەڕو كوشتاری خستووەتە ناویانەوە} وەك جیهانی ئەمڕۆی خۆمان كە هەر پێنچیانی تێدا هاتوەتە دیو وا لە تالاوی بەرهەمی كردارە پیسەكانمان دەخۆینەوە؟! چاوكوێرەو گوێ كەڕەو ژێری نەماوەو چاكمان بەلاوە خراپەو خراپمان بەلاوە چاكە پەنا دەگرم بەاللهلەم چارە رەشیەی كە ئەمڕۆ مرۆڤ بەسەری خۆیدا هێناویەتی وبیری لێ ناكاتەوە؟!!

(٣٦) جا بەدوای ئەو شتە مەكەوە كە زانیاریت لە بارەیەوە نییەو هەر لە خۆتەوە كردەوەیەك مەكە یان بڕیارێك مەدەو قسەیەك مەكە بە بێ زانیاری ، چونكە بەراستی گوێ وچاوو ودڵ هەمو یەكێك لەئەوانە لەو بارەوە پرسیاریان لێ دەكرێتو خاوەنەكەیان گرفتار دەبێت ئەگەر بەناڕەوا بەكارهێنرابن.

(٣٧) ئەوسا بەسەر زەویدا بەدەعیەو فزیەوە نەچیت بەراستی تۆ هەرگیز ناتوانیت بەو ڕێكردنەت زەوی لەت بكەیتو لە درێژی دا بەچیاكان بگەیت، ئیتر بۆ خۆت هەڵدەكێشی وخۆت بە لێهاتوو گەورە دەزانی؟

(٣٨) هەمو دانەیەك لەوانەی كە باسكران خراپەكەیان لە لای پەروەردگارت بێزراوو تاوانەو نابێ باوەڕداران ئەنجامیان بدەن.

(٣٩) ئا ئەوەی كە باسكران بەشێكە لەو داناییەی كە پەروەردگارت رەوانەی كردوتە لات، واتە: ئەو قەدەغە كراوانە فەرمانی ئێمەیەو لەسەر بناغەی دانای دامان ناوەو هەر كەسێك دژایەتیان بكات دژایەتی حیكمەت ودانایی الله دەكات وكافر دەبێ، جارێكی تر هەڕەشە لەبت پەرستی وهاوبەشدانان دەكاتو دەفەرموێ: لەگەڵ اللهدا هیچ شتێكی تر بەخوای خۆت دانەنێیتو نەیپەرەستیت چونكە ئەگەر جگە لە الله كەسێكی تر بپەرستیتو گوێ رایەڵی فەرمانەكانی بكەیت بەلۆمە كراویو دوركراوەیی لە هەمو رەحمەتو سۆزێكەوە دەخرێیتە ناو دۆزەخەوە، ئەگەرچی ئەم ئایەتانە روی قسەی لەگەڵ پێغەمبەرمان ﷺ دا یە بەلام مەبەست پێی هەمو گەلەكەیەتی.

پاشان دەمكوتی ئەوانە دەكات كە دەڵێن: فریشتەكان كچانی خوادانو دەفەرموێ:

(٤٠) ئایا پەروەردگارتان ئێوەی تایبەت كردوە بە كوڕەوەو بەلام لەناو فریشتەكاندا مێ كانی هەڵگرتوە بۆ خۆی؟! بەراستی ئێوە قسەیەكی زۆر خراپی گەورە دەكەنو بڕیارێكی زۆر ناشرینو

ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوۡحَىٰٓ إِلَيۡكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلۡحِكۡمَةِۗ وَلَا تَجۡعَلۡ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلۡقَىٰ فِي جَهَنَّمَ مَلُومٗا مَّدۡحُورًا ﴿٣٩﴾ أَفَأَصۡفَىٰكُمۡ رَبُّكُم بِٱلۡبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًاۚ إِنَّكُمۡ لَتَقُولُونَ قَوۡلًا عَظِيمٗا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِيَذَّكَّرُواْ وَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا نُفُورٗا ﴿٤١﴾ قُل لَّوۡ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٞ كَمَا يَقُولُونَ إِذٗا لَّٱبۡتَغَوۡاْ إِلَىٰ ذِي ٱلۡعَرۡشِ سَبِيلٗا ﴿٤٢﴾ سُبۡحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوّٗا كَبِيرٗا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبۡعُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ وَإِن مِّن شَيۡءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمۡدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفۡقَهُونَ تَسۡبِيحَهُمۡۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورٗا ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا مَّسۡتُورٗا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ﴿٤٦﴾ نَّحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَا يَسۡتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذۡ يَسۡتَمِعُونَ إِلَيۡكَ وَإِذۡ هُمۡ نَجۡوَىٰٓ إِذۡ يَقُولُ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَالَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٤٨﴾ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾

نەزانانە دەدەن، هەرچەند فریشتەكان نێرو مێیان نییەو ئەوگومانەی ئێوە زۆر هەڵەیە بەلام چۆن بۆ خۆتان كوڕ بەچاك دەزاننو كچتان ئەوەندە پێ ناخۆشە زۆر جار زیندە بەچاڵیان دەكەن لەبەر عەیبە كەچی ئەوە دادەنێن بۆالله؟! بێگومان پەروەردگاری جیهان بێنیازە لەوەی كە هاوەڵو منداڵی هەبێت.

(٤١) بەراستی ئێمە ئا لەم قورئانە دا چەندین باس وداستانی جۆراو جۆرمان گۆڕی بۆ ئەوەی بیر بكەنەوەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن، كەچی ئەو هەمو داستانو باسە جیاجیانە جگە لە دوركەوتنەوە لە ئایین وراكردن لێی سودێكی تری پێ نەدان؟! وە یەكێك لەوانەی كە لەم قورئانەدا بەشێوە جۆراوجۆرو بە بەڵگەی تەواوو گونجاوو لەگەڵ عەقڵدا هاتوە یەكخواپەرستیو یەكتایی اللهیە كە بناغەی هەمو بنەماكانەو هەر لەم سوورەتەدا چەندین جار هاتوە كە ئەمەش یەكێكی تریانە كە دەفەرموێ:

(٤٢) بڵێ : ئەگەر لە گەڵ اللهدا چەند خوایەكی تر هەیە وەك ئەوان دەڵێن: دەی ئەوان هەوڵی دۆزینەوەی رێگەیەك بدەن كە خۆیان بە خاوەنی عەرش كە اللهیە بگەیەننو دەسەڵاتو فەرمانڕەوایی جیهانی لە دەست دەر بهێنن، جا ئەو كاتە خۆیان بە ئارەزۆی خۆیان یاساو بەرنامە دابنێنو گوێ بە فەرمانی اللهنەدەن خۆ ئاشكرایشە كە ئەمەیان پێ ناكرێت دەی هەتاكەی لەسەر دژایەتی فەرمانەكانی الله دەڕۆن؟! ئینجا الله خۆی دەفەرموێ:

قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا ﴿٥١﴾ يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٥٢﴾ وَقُل لِّعِبَادِي يَقُولُواْ ٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ يَنزَغُ بَيۡنَهُمۡۚ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ كَانَ لِلۡإِنسَٰنِ عَدُوّٗا مُّبِينٗا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِكُمۡۖ إِن يَشَأۡ يَرۡحَمۡكُمۡ أَوۡ إِن يَشَأۡ يُعَذِّبۡكُمۡۚ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ وَكِيلٗا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعۡلَمُ بِمَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَلَقَدۡ فَضَّلۡنَا بَعۡضَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ عَلَىٰ بَعۡضٖۖ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿٥٥﴾ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ﴿٥٧﴾ وَإِن مِّن قَرۡيَةٍ إِلَّا نَحۡنُ مُهۡلِكُوهَا قَبۡلَ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَوۡ مُعَذِّبُوهَا عَذَابٗا شَدِيدٗاۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَسۡطُورٗا ﴿٥٨﴾

(٤٣) بێنیازو پاكو مونەزەهە ئەو زاتە لەوەی كە وێنەو هاوەڵی بۆ دابنرێتو خاوەن شكۆو بەرزە بە بەرزاییەتیەكی بێ نیهایەت گەورەو زۆردوورە لەوەی كە موشریكان دەیڵێن.

(٤٤) ئەوەی كە لە هەر حەوت ئاسمانەكاندایەو لە زەوی و لە ناویاندا هەیە هەموی تەسبیحاتی خوای خۆیان دەكەن بەو شێوەی كە ﷲ خۆی دەزانێ، وە هیچ شتێك نیە مەگەر تەسبیحاتی خوای خۆی دەكات بەڵام ئێوە لە تەسبیحاتی ئەوان تێ ناگەن بێشك كە ئەو زاتە بەحەوسەڵەیەو پەلە ناكات لە تۆڵەسەندنەوە لەوانەی كە هاوەڵو منداڵی بۆ دادەنێن ، بەڵكو لێ بوردەو چاوپۆشی كەرە لەتاوان، جا ئەگەر تەوبە بكەنو بگەڕێنەوە لێیان خۆش دەبێت. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لَا أَحَدَ أَصْبَرُ عَلَى أَذًى يَسْمَعُهُ مِنَ اللهِ عَزَ وَجَل إِنهُ يُشْرَكُ بِهِ وَيُجْعَلُ لَهُ الْوَلَدُ ثم هُوَ يُعَافِيهِمْ وَيَرْزُقُهُمْ / متفق عليه/ هیچ كەسێك لە سەر ئەو ئازارەی كە بیستبێتی لە ﷲ بەدەسەڵات بەشكۆو بەسەبرترو خۆگرتر نییە ئەو زاتە هاوەڵو منداڵی بۆ دادەنرێت، پاشان ئەو هەر دەیانپارێزێت لە بەڵاو سەلامەتیان دەكاتو رزقیشیان پێ‌دەدات}.

(٤٥) جا هەر كاتێك تۆ قورئان بخوێنی ئێمە لە نێوان تۆو ئەوانەی كە باوەڕیان نییە بە رۆژی دوایی پەردەیەكی شاراوەو داپۆشراو دروست دەكەین، جا ئیتر ئەو كاتە حەقو راستی نابیستنو نابینن‌و ئەو قورئانە لە سەریان كاریگەر نابێت.

(٤٦) ئەوسا ئێمە بەهۆی خراپی خۆیانەوە دامان ناوە لەسەر دڵی ئەوان چەندین پەردە بۆ ئەوەی كە هیچ شتێك لە قورئان فێر نەبن وفامی نەكەن، وە لەناو گوێیاندا باری گرانمان داناوەو گوێمان كەڕ كردون كە هیچ شتێكی بەسود نەبیسن ، وە هەر كاتێك باسی یەكتایی پەروەردگاری خۆت بكەیت لەم قورئانەداو بڵێیت {لا اله الا ا } هیچ پەرستراوێكی راستەقینە جگە لەﷲ نیە و تاكەو شەریكی نیە، ئەوان پشتی تێدەكەن‌و لەو قورئانەو لەو قسە جوانانە را دەكەن!

(٤٧) ئێمە دەزانین بەو جۆرە گوێ گرتنەی ئەوان كاتێك كە گوێ لە تۆ دەگەرن كە چ مەبەستێكیان هەیەو چۆن گوێ دەگرن‌و چی دەڵێن، وە ئاگادارین لێیان ئەو كاتەی كە ئەو موشریكە ناحەق وێژانە بە نهێنیو بەچپە قسە دەكەن و دەڵێن بە باوەڕداران: بەراستی ئێوە هەرلە جادو لێ كراوێك پەیڕەوی دەكەن،واتە: ئەوەی كە ئێوە پەیڕەوی دەكەن پێغەمبەر نیە بەڵكو پیاوێكی جادو لێكراوە.

(٤٨) سەیر بكە چۆن وێنە دەهێننەوە دژی تۆ، جارێك بە جادو گەرت دادەنێن‌و جارێكی تر بەجادو لێ كراو، جارێك شێتی سەرلێشێواوو جارێكیش شاعیری لێزان!! بەراستی ئەوانە رێگایان لێ هەڵە بوەو توانای دۆزینەوەی رێگای راستیان نیە.

(٤٩) خۆ ئەو بێباوەڕانە دەڵێن: كاتێك كە ئێمە بوین بە ئێسقان‌و رزین ئایا تازە زیندو دەكرێنەوەو دەبینەوە بەدروست كراوێكی تازە، شتی وا دورەو ناگونجێتو پەروەردگار ئیشی وای پێ ناكرێت، ئەگەر پێتان وایە دروستكردنتان بۆ جارێكی تر لە ئێسقانی رزیو پتوركاو نەگونجاوە ،

(٥٠) دەی ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ببن بەبەرد یان ببن بە ئاسن بەكەیفی خۆتان.

(٥١) یان ببن بە هەردروستكراوێكی تر كە لە دڵی خۆتاندا زۆر گەورەیەو بە دوورو نەگونجاوی دەزانن كە پاش نەمانی زیندو بكرێتەوە، واتە: ئەگەرئەتوانن بەهەرچی ئەبن ببن‌و رێگا لەزیندو كردنەوە بگرن، دڵنیا بن كەﷲ زیندوتان دەكاتەوە، جا ئەوان دەڵێن: كێ دووبارە زیندومان دەكاتەوە؟! بڵێ: ئەو كەسەی كە یەكەم جار لە هیچ دروستیكردوون ئەو كەسە دووبارە زیندوتان دەكاتەوە ، جا ئەوان كە هیچ وەڵامێكیان نیە بۆ قسەكانی تۆ بەگاڵتەوە سەریان رادەوەشێنن كە گویا نازانین چی دەڵێیت ئەوەندە دەزانین كە ئەم قسەیە سەرسوڕهێنەرەو ناچێت

به مێشکی ئێمەداو دەڵێن: کەی ئەوڕۆژە دێت کە ئێمە زیندو بکرێینەوە؟! پێیان بڵێ: بەراستی ئەو ڕۆژی زیندو کردنەوە نزیکە،

(٥٢) لە ڕۆژێك دا دەبێ کە بانگ کەر بە فەرمانی پەروەردگار بانگتان دەکاتو ئێوەش کوتوپڕ لە گۆڕەکانتان وەڵام دەدەنەوەو سوپاسی اللَّهُ دەکەن ، بەڵام سوپاسە کەتان ناچارییەو سودی نابێ، واتە ئەو لاشەی ئێوە کە رزیوە ئەو ڕۆژە زیندو دەبێتەوەو ملکەچانە فەرمانی پەروەردگاری بەجێدەهێنێت خۆ ئەو کاتەش وا گومان دەکەن کە لەدونیادا جگە لە ماوەیەکی زۆر کەم نەژیاوون، واتە: ئەم ژیانەی کە هەمو شتێکتان بۆ لەدەست داوە لەو کاتەدا دەڵێن زۆر کەم بووەو نەمانتوانیوە باش بیر بکەینەوەو سودی لێ وەر گرین، پاش ئەوە خوای میهرەبان تەمێی بەندە چاکەکانی دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٣) ئەی محمد ﷺبە بەندەکانی من بڵێ: با لە کاتی قسە کردندا ئەو قسەیە بڵێن کە چاکترە، بۆ؟ چونکە بەراستی شەیتان هەوڵی دروستکردنی ناکۆکی دەدات لە نێوانیاندا ، بێگومان شەیتان بۆ ئینسان دوژمنێکی ئاشکرایە. واتە: ئامانجی شەیتان ئەوەیە کە لەنێوان بەندەکانی اللَّهُ دا کێشەوناکۆکی دورست بکات جا با ئاگایان لەقسەوزمانو هەڵسوکەوتیان بێتو ماوە بەشەیتان نەدەن کە بێتە نێوانیانەوە تەنانەت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:{ **لا يُشِيرُ أَحَدُكُمْ عَلَى أَخِيهِ بِالسِّلاحِ فَإِنَّهُ لا يَدْرِي لَعَلَّ الشَّيْطَانَ يَنْزِعُ فِي يَدِهِ فَيَقَعُ فِي حُفْرَةٍ مِنْ النَّارِ**/متفق عليه/ با هیچ کام لە ئێوە بە چەك ئاماژە نەکات بۆ براکەی خۆی چونکە لەوانەیە کە شەیتان هەڵداتە دەستیو براکەی خۆی بکوژێت جا ئەو کاتە بەهۆی ئەو ئیشەوە بکەوێتە ناو چاڵێکی ئاگرەوە}.

(٥٤) پەروەردگارتان لە خۆتان زاناترە بە کاروباری ئێوەو دەزانێ چی بەسودتانەو چی بەزیانتانە ، جا ئەگەر ئارەزۆی لێ بێت رەحمتان پێ دەکات ونازو نیعمەتی خۆی دەرژێنێتە سەرتان ، وە ئەگەر ئارەزۆی لێ بێت سزاتان دەداتو کەسیش ناتوانێت رێگەی لێ بگرێت، دەی ژیرو بەفام ئەو کەسەیە کە تەنها لەو بترسێتو بەندایەتی ئەو بکات بەڵکو ئەو زاتە بەزەیی پێدابێتەوەو عەفوی بکات وە ئێمە تۆمان نەناردوە ئەی محمد ﷺکە تۆ چاودێرو پاسەوانی ئەوان بیو نەیەڵیت کە هەڵەو تاوان ئەنجام بدەن، تۆ پەیامی خۆت رابگەیەنە.

(٥٥) خۆ پەروەردگارت ئەی محمد ﷺ شارەزاو ئاگادارە بەوەی کە لە ئاسمانانو زەویدا هەیەو هیچی لێ ون نابێت دەزانێت کە ئەوان چۆن هەڵس وکەوت دەکەن لەگەڵ تۆداو تۆش چۆن پەیامەکەت بەئەوان دەگەیەنیت، خۆت بگرەو دڵت نارەحەت نەبێ، وە بەحەقیقەت ئێمە بەرزمان کردەوە هەندێك لە پێغەمبەران بەسەر هەندێکی تریان داو زەبووریشمان دا بە داوود. قورئانو زەبوورو تەورات وئینجیل ناوی چوار پەڕاوون کە اللَّهُ بۆ پێغەمبەرانی ناردوە،

(٥٦) ئەی محمد ﷺپێیان بڵێ: با بانگ بکەنە ئەوانەی کەگومانتان دەبرد کە خودانو دەتوانن بێن بە هاوارتانەوە جگە لە اللَّهُ ، جا باش بزانن کە ئەوان دەسەڵاتی ئەوەیان نیە کە هیچ زیانێك لەسەرتان لابەن یان بیگۆڕنو بیدەن بە سەر کەسێکی تردا. لەم ئایەتەدا مەبەست لە پیاوچاکانن کە جگە لە اللَّهُ هاواریان لێ دەکرێت چونکە دەفەرموێ:

(٥٧) ئەوانەی کە ئەوان دەیان پەرستنو هاوریان لێ دەکەن کامیان زۆر نزیکترە لە پەروەردگاریو ساڵح ترە بەشوێن هۆدا دەگەڕێن بە عیبادەتو بەندایەتی کردنی پەروەردگاری خۆیان، وە ئومێدیان هەیەو چاوەڕوانی رەحمەتی پەروەردگاریان دەکەنو لە سزای دەترسن، چونکە بەراستی سزای پەروەردگارت ئەوەندە سەختە کە شایانی خۆپاراستنە لێی. لە بارەی دابەزینی ئەم ئایەتەوە وتراوە کەکۆمەڵێك لەعەرەب بەندایەتی چەند کەسێکی جنۆکەیان دەکرد، جا جنۆکەکان موسڵمان بون بەڵام ئەوان هەر موشریك بون کەوا بو ئەوانەی کەئەوان دەیان پەرستن وا ئێستا کێ بەرکێ دەکەن بۆ رازی کردنی خوای باڵا دەست کەچی مرۆڤی بێ ئاگا هەر خەریکی پەرستنی ئەوانە، هەندێکیش دەڵێن: مەبەست عیسا ودایكو فریشتەکانە کە هەریەکەیان کۆمەڵە خەڵکێك پەرستونیودەیان پەرستن کەچی ئەوان هەوڵی رەزامەندی اللَّهُ دەدەن ودژی موشریکانن. راغیبی ئەسفەهانی لە بارەی وشەی ﴿ٱلۡوَسِيلَةَ﴾ دەڵێت: (الوسيله : **التَّوَصُّلُ إِ الشيء بِرَغْبَةٍ وَهِيَ أَخَصُّ مِنَ الْوَصِيلَةِ لِتَضَمُّنِهَا لِمَعْنَى الرغبة.** وشەی (الوسيله) واتە: گەیشتن بەشت کە مەیلو ئارەزۆو لێیەتی، وە ئەم وشەیە لە وشەی (الوصيله)پێش ترو تایبەتی ترە بە هۆی ئەوەی کە مانای ویستو ئارەزۆی لە خۆگرتوە کەواتە (الوسيله) نزیك بونەوەو گەیشتنێکە کە مەیلو ئارەزۆی لێیەتی، بەراستی وەسیلەو هۆی نزیك بونەوەی بەندە لە اللَّهُ جگە لە بەندایەتی راستەقینە هیچ شتێکی تر نیە.

(٥٨) جا هیچ خەڵکی گوندێك نیە کە ئێمە ئەوان بەر لە هاتنی ڕۆژی قیامەت لەناوی ببەین یان سزای بدەین بە سزایەکی زۆر توندو سەخت لەبەر تاوان وخراپەی خۆیان مەگەر هەموی ئەوانە بەگوێرەی بڕیارێکەوەیە کە لە (لەوحولەحفوز)دا تۆماکراوە ،واتە: خوای باڵادەست پێش بونی ئەو خەڵکە زانای بوە کەچی دەکەن وچییان بەسەر دێتو ئەو شتە تۆمار کراوەو

وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرۡسِلَ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلۡأَوَّلُونَۚ وَءَاتَيۡنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبۡصِرَةٗ فَظَلَمُواْ بِهَاۚ وَمَا نُرۡسِلُ بِٱلۡأٓيَٰتِ إِلَّا تَخۡوِيفٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِۚ وَمَا جَعَلۡنَا ٱلرُّءۡيَا ٱلَّتِيٓ أَرَيۡنَٰكَ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلۡمَلۡعُونَةَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِۚ وَنُخَوِّفُهُمۡ فَمَا يَزِيدُهُمۡ إِلَّا طُغۡيَٰنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٠﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ قَالَ ءَأَسۡجُدُ لِمَنۡ خَلَقۡتَ طِينٗا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذۡهَبۡ فَمَن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمۡ جَزَآءٗ مَّوۡفُورٗا ﴿٦٣﴾ وَٱسۡتَفۡزِزۡ مَنِ ٱسۡتَطَعۡتَ مِنۡهُم بِصَوۡتِكَ وَأَجۡلِبۡ عَلَيۡهِم بِخَيۡلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِ وَعِدۡهُمۡۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٞۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلٗا ﴿٦٥﴾ رَّبُّكُمُ ٱلَّذِي يُزۡجِي لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِي ٱلۡبَحۡرِ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٦٦﴾

به بێ گۆڕان هەر ئەوەو هەر ئەوەش دەبێ. ئیبنوعەباس دەڵێ: {قالتْ قُرَيْشٌ لِلنبيِ ﷺ ادْعُ لَنا رَبكَ أنْ يَجْعَلَ لنا الصفا ذَهَبًا وَنُؤْمِنُ بِكَ قالَ وَتَفْعَلُونَ قالُوا نَعَمْ قالَ فَدَعَا فَأَتاهُ جِبْرِيلُ فَقالَ إن رَبكَ عَز وَجَل يَقْرَأُ عَلَيْكَ السلامَ وَيَقُولُ إنْ شِئْتَ أَصْبَحَ لَهُمْ الصفا ذَهَبًا فَمَنْ كَفَرَ بَعْدَ ذَلِكَ مِنْهُمْ عَذَّبْتُهُ عَذَابًا لا أُعَذِّبُهُ أَحَدًا مِنَ العَالَمِ - وَإنْ شِئْتَ فَتَحْتُ لَهُمْ بَابَ التوْبَةِ وَالرَّحْمَةِ قالَ بَلْ بَابُ التوْبَةِ وَالرَّحْمَةِ /أ د، صححه الالبا / واتە: قورەیش بە پێغەمبەریان وت: داوا بکە لە پەروەردگارت کە کێوی "سەفا" بکات بەزێڕ بۆمان جا باوەڕت پێدەکەین ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەگەر وابو باوەڕ دەهێنن؟ وتیان: بەڵێ، ئیبنوعەباس دەڵێ: جا پێغەمبەر ﷺ دوعای بۆ کردن، ئەوسا جبرەئیل هات بۆلای و وتی: بەراستی پەروەردگارت سەلامت لێدەکات و دەفەرموێ: ئەگەر دەیەوێت کێوی "سەفا"یان بۆ دەکەم بەزێڕ ، جا ئەو کاتە هەر کەسێکیان کە باوەڕی نەهێنا سزایەکی وای دەدەم کە هیچ کەس لەم جیهانە ئاوا سزا نادەم ، وە ئەگەر دەیەوێت دەرگای تەوبەو لێبوردنیان بۆ دەکەمەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بەڵکو دەرگای کراوەی تەوبەو لێبوردنم دەوێت. پاشان پەروەردگار ئەم ئایەتەی رەوانە کرد کە دەفەرموێ:

﴿٥٩﴾ جا هیچ شتێك رێگا لە ئێمە ناگرێ بۆ ئەوەی لەسەر داخوازی خۆیان نیشانەی راستی تۆیان بۆ بنێرین جگە لەوەی کە گەلانی پێش ئەوان داوایان کردوەو بۆیان هاتوەو بەدرۆیان خستوتەوەو سزا دراون و لە ناوبراون، ئێمە ئەمانەوێ کە ئەم گەلەی تۆ بمێنێ و بەتەواوی لەناو نەبرێن بۆیە داخوازیەکانیان سەبارەت بە دابەزینی نیشانەی راستی تۆ رەوانە ناکەین بۆیان ئەوە بو کە ئێمە دامان بەگەلی سەمود ئەو وشترەی کە زانراوە بەداوای ساڵح کە چاو رۆشنیەك بو بۆ ئەوان ئەبوایە بەبینینی ئەو وشترە باوەڕیان بە ساڵح بکردایە کەچی ئەوان ستەمییان لەخۆیان کرد بە هۆی حوشترەکەوە کە کوشتیان لە دوایدا سزادران و بەدەنگێك لەناوچون، وە ئێمە هیچ نیشانەیەك لەنیشانەکان رەوانە ناکەین مەگەر بۆ ئەوەی خەڵکی بترسێت و لە خراپەو تاوان پەشیمان ببێتەوە ئەگەر پەشیمان نەبونەوە سزا دەدرێن، جا تۆ ئەی محمد ﷺ لەسەر راگەیاندنی خۆت سوربەو لە پرو پاگەندەی دوژمن مەترسە.

﴿٦٠﴾ جا بیربکەرەوە لەو کاتەی کە ئێمە وتمان بە تۆ بەراستی پەروەردگارت گەمارۆی خەڵکی داوەو کەس لە دەستی ئەو دەرناچێت و هەمو لەژێر چاودێری و ئاگایی ئەودان و خوا تۆ دەپارێزێت لەوان، وە ئێمە ئەو بینینەی تۆمان لەکاتی شەوڕەوی وسەرکەوتن بۆ ئاسمانەکاندا دانەناوە بێجگە لەوەی کەتاقی کردنەوەیەك بێ بۆ خەڵك، جا ئەوەی کە دڵی بەروناکی ئیمان کرابێتەوە، وەك ئەبوبکر باوەڕت پێ دەکات و ئەوەش کە دڵی رەشبێ بەهۆی ستەم و کوفرەوە باوەڕت پێ ناکات جا هەردووکیان لەیەك جیا دەبنەوەو دەناسرێن و رۆژی دوای نکولی لێ ناکرێت، وە هەروەها ئەو درختە نەفرین لێ کراوەی کە لە قورئاندا باسکراوە کە درەختی "زەقوم"ـە هۆیەکی تری تاقی کردنەوەیە، جا هەندێك دەیان وت: چۆن دەگونجێت لەناو ئاگردا درەخت هەبێت و نەسوتێت، وە ئێمە دەیانترسێنین لەسزای دنیاو پاشەرۆژ بەڵام ئەو ترساندنە هیچ شتێك لەوان زیاد ناکات جگە لەخۆبای بون و سەرکەشییەکی گەورە، ئەمە بەرپەرچێکی گرنگ و گەورەیە بۆ ئەوانەی کە بەرژەوەندیان کردوە بە خوای خۆیان و هەمو شتێك بەسەنگی بەرژەوەندیدا کێشانە دەکەن، چونکە مادام خوا خۆی دەزانێ ترساندنیان چاکیان ناکات بەڵکو زیاتر ملهوڕو سەرکەش دەبن ، جا بۆ فەرمانی ترساندنی داوە؟! وردبنەوە!! جارێکی تر خوای میهرەبان و دانا باسی کێشەی نێوان ئادەم سەلامی خوای لەسەر بێ و شەیتانمان بۆ دەکات و دەفەرموێ:

﴿٦١﴾ بیر کەرەوە لەو کاتەی کە وتمان بە فریشتەکان سوجدە ببن بۆ ئادەم جا ئەوانیش سوجدەیان بۆ برد جگە لە ئیبلیس کە گوتی ئایا سوجدە ببەم بۆ کەسێك کە لە قوڕ دروستت کردوە؟

﴿٦٢﴾ وتی: پێم بڵێ ئەوە کەسێکی وایە کە تۆ رێزی ئەوت داوە بەسەرمنداوداوام لێدەکەیت کە سوجدەی بۆ بەرم؟ ئەوە شتێکی

ئەوەندە کەمو لاوازە کە ئەگەر تۆ من دوا بخەی هەتا ڕۆژی قیامەتو ماوەم پێ بدەیت سوێند بێت هەمو ئەولادەکانی بە سەر لێ شێواندنو گومڕاهکردن لەناویان ببەم جگە لە کەمێکیان نەبێت کە ئەوانە خۆیان بۆ بەندایەتی پەروەردگار یەك لا کردوەتەوە.

(٦٣) ﷲ فەرموی: بڕۆ چی دەکەی بیکە، جا ئەوەی لەوان کە پەیڕەویت لێوە بکات، ئەوسا بە دڵنیاییەوە دۆزەخ بەشتانەو ئەو بەشەش پاداشتێکی فرەوان کراوەیە بۆتان.

(٦٤) بڕۆ چەندێك لەوان دەتوانی بە دەنگەکەت کە گۆرانیو مۆسیقایە یان هەر دەنگێکی بانگ کەرە بۆ تاوان، ئارەزۆیان بجوڵێنەو هانیان بدە لەسەر تاوانو لە ڕێگای ڕاست لایان بدە، جا بە سوارەو پیادەکانتاوە هەرچیت هەیە کۆی کەرەوە لێیانو هێرش بکە سەریان، وە هاوبەشییان بکە لە ماڵیان ولە ئەولادیان دا تا بەشێوەیەك بەکاری بهێنن کە لە ڕەزامەندی تۆ دابێت وەك ئەوەی ماڵیان لە حەرام بە دەست بهێنن یان لە حەرامدا خەرجی بکەن یان زەکات نەدەن یان توشی زینایان بکەیت یان منداڵەکانیان فێری ڕەوشتو ئەخلاق نەکەن یان بەرگری چاکەو جیهادیان لێبکن، تەنانەت ئەگەر پێش خواردن یان نزیکی نێوان ژنو پیاو ناوی خودا نەبرێت شەیتان ئامادە دەبێتو هاوبەشی دەکات، وە بەڵێنیان پێ بدەو هەمیشە نەداریو کەمدەستیان پێش چاو بخە تا لەترسی کەمدەستبون هەر بەدنیاوە سەرقاڵ بنو کردەوە خراپەکانیان بۆ برازێنەوەو بەڵێنی نەهاتنی دوارۆژیشیان پێبدەو بەدڵنیاییەوە شەیتان هیچ بەڵێنێك بەوان نادات جگە لە فریودانو دەستخەڕەکردن، جا ئەی شەیتان چیت پێ دەکرێت بیکە.

(٦٥) بەڵام بزانەکە، بێگومان تۆ ئەی شەیتان هیچ دەسەڵاتێکت نیە بەسەر بەندە ڕاستەکانی منداو ناتوانی فریویان بدەیت و بیانخەڵەتێنی، خۆ بەسە کە پەروەردگارت پشتیوان بێت بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی هەیەو پشتی پێ دەبەستن، ئینجا خوا بەشێکی تر لە نیعمەتەکانی خۆی دەخاتە بەرچاومانو دەفەرموێ:

(٦٦) پەروەردگارتان ئەو زاتەیە کە پاڵ دەنێ بە کەشتیەکانتانەوە لەو دەریایەدا تا بگەڕێن بە شوێنی رزق و ڕۆزییەك کە چاکەو نیعمەتی پەروەردگارە جا ژیانی خۆتانی پێ دابین بکەن بەراستی ئەو پەروەردگارەی ئێوە زۆر بەسۆزو میهرەبانە بۆتان. بەڵام ئێوە زۆر سپڵەو نمەك نەناسن.

وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِي ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمْ أَن يَخْسِفَ بِكُمْ جَانِبَ ٱلْبَرِّ أَوْ يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمْ أَمِنتُمْ أَن يُعِيدَكُمْ فِيهِ تَارَةً أُخْرَىٰ فَيُرْسِلَ عَلَيْكُمْ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغْرِقَكُم بِمَا كَفَرْتُمْ ثُمَّ لَا تَجِدُوا۟ لَكُمْ عَلَيْنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾ ۞ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِىٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُوا۟ كُلَّ أُنَاسٍۭ بِإِمَٰمِهِمْ فَمَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلْءَاخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾ وَإِن كَادُوا۟ لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ ٱلَّذِىٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ لِتَفْتَرِىَ عَلَيْنَا غَيْرَهُۥ وَإِذًا لَّٱتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَآ أَن ثَبَّتْنَٰكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْـًٔا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَٰكَ ضِعْفَ ٱلْحَيَوٰةِ وَضِعْفَ ٱلْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾

(٦٧) جاهەر کاتێ کەئێوە لە ناو دەریادا توشی نارەحەتی وزیان بوون لەو کاتەدا ئەوانەی کەپەروستوتانن لێتان ون دەبن جگە لە ﷲ و لەو کاتەدا تەنها لەو دەپاڕێنەوە کەچی کاتێك کە ئێوەی ڕزگار کردو هاتنە وشکاییەوەو ترستان نەما پشت دەکەنە ئایینەکەی خواو گوێی پێنادەن، وە ئینسان هەر ئاوا سپڵەونمەك نەناسەو زوو نیعمەتی ﷲی لە بیر دەچێتەوە. ئەم مرۆڤە چۆن بیر دەکاتەوە ئایا پێی وایە کە ﷲتەنها لە ناو دەریادا دەتوانێت سزای بداتو نقومی بکاتو دای پۆشێت؟!

(٦٨) ئایا ئێوە کە هاتنە وشکایی ئیتر لە سزای پەروەردگار بێ ترسن وناترسن لەوەی کە خوا بە گۆشەیەکی ئەو وشکاییەدا بتانبات بەناخی زەویدا وەك قاروون؟ یان بەرد بارانتان بکات وەك گەلی لووت؟ لەپاشان هیچ پارێزەرو یارمەتی دەرو پشتیوانێکتان دەست نەکەوێت؟

(٦٩) یان ئایا ئێوە ناترسن جارێکی تر بتانگەڕێنێتەوە بۆ ناو دەریاوپیویستیتان بکەوێتە ئەوسەفەرە، جا بایەکی زۆر بەهێزتان بۆ ڕەوانە بکات وە کەشتیەکانتان بشکێنێو لەو دەریایەدا نوغرۆتان بکات بە هۆی ئەوەی کە بێباوەڕو نمەك نەناسبون لە پاشان کەسیشتان دەستان نەکەوێت کە تۆڵە لە ئێمە وەرگرێتەوە بۆتان؟ واتە: نەکەس ئەتوانێ بتان پارێزێو نەکەستان هەیە پاش خۆتان بتۆانێ تۆڵەتان لە خوا وەرگرێت.

جا باسپڵە نەبنو لە سزای بترسنو بزانن لە هەرکوێدا بن دەتوانێت تۆڵەتان لێوەرگرێت، جا چۆن لە ناو دەریاو لە کاتی دژواری دا تەنها هاوارتان لەو دەکرد با لە وشکایو کاتی فەرەحیش هەر هاوار لەو بکەنو هاوەڵی بۆ دانەنێن.

(٧٠) خۆ بەراستی ئێمە رێزمان گرتوە لە رۆڵەکانی ئادەم و هەڵمان گرتوون لە دەریادا بە هۆی کەشتیەوەولە وشکاییدا بەهۆی ئەوشتانەی کە هاتوچۆی پێدەکرێتو رۆزی ئەوانمان لە شتەپاکەکان داوەو رێزی ئەوانمان داوەبەسەر زۆربەی ئەوانەی کە دروستمان کردون بەرێزلێنانێکی بەرچاووشایان کەزۆربەی دروستکراوەکانی تر گەردنکەچو رامن بۆیان، جا با مرۆڤ سپڵە نەبێتو سوپاسی ئەو نیعمەتانە بکات، پاشان اللّٰه ی بالأدەست کتوپڕ دەمان باتەوە بۆ قیامەتو دەفەرموێ:

(٧١) بیرکەرەوە لە رۆژێك کە ئێمە بانگ دەکەینە هەمو خەڵك لە گەڵ ئیمام وپێشەواکەی وچاك وخراپ لەیەك جیا دەکەینەوە، جا ئەو کەسەی نامەی کردەوەکانی بە دەستی راست پێ بدرێت خۆش بەختە، ئەوسا ئەوان نامەی کرداری خۆیان دەخوێننەوەو دەبینن بە ئەندازەی ئەو دەزوە باریکەی ناو دەنکی خورما زیانیان لێ نەدراوەو هەمو چاکەکانیان لە گەورەو بچووك تۆمار کراوە.

(٧٢) جا ئەو کەسەی کە لە دنیادا کوێربوەو لەگەڵ بوونی ئەو هەمو بەڵگە گەورەو رۆشنانەدا رێگای خوای نەدۆزیوەتەوە ئا ئەوە لە رۆژی قیامەتیشدا کوێر دەبێو بەکوێری حەشر دەکرێتولە هەمو کەس زیاتریش رێگای لێ ون دەبێو بێ بەڵگەو داماو سەرشۆڕتر دەبێو لە دۆزەخدالەبیر دەبرێتەوە.

(٧٣) بەراستی نزیك بو کە ئەوان تۆ فریو بدەنو تووشی بەڵات بکەن لە بارەی ئەوشتەوە کە وەحیمان کردوەتە لات ، تا تۆش درۆ بەدەم ئێمەوە بکەیتو ماوەیەك خۆت بگریت لەدژایەتی خواکانیان، جا ئەو کاتە ئەوان تۆیان دەکرد بە دۆستی خۆیان ، واتە: کێشەی ئەوان لەگەڵ تۆدا لەسەر خۆت نیەو ئەوان تۆ بە خاوەن خووڕەوشتی جوان دەناسن بەڵام کێشەی ئەوان لەگەڵ ئەم بانگەوازەی تۆدایە کە دژ بەخواکانیانەو هاندەرە بۆ یەکخوا پەرستی. بەراستی ئەگەر بەرژەوەندی پەرستەکانی ئەمڕۆیش لەوکاتەدا بۆنایە هەروەك ئەمڕۆ دەبینین بەناو مەسڵەحەتو بەرژەوەندیو سیاسەتەوە دەیان وت: بۆ ناگونجێین لەگەڵتاندا بەڵکو ئێمە ئەو گونجانو بەیەکبونە بەپێویست دەزانینو پێمان وایە کە لە بەرژەوەندی هەمو لایەك دایەو بیروبۆچونی هەموکەسێکیش لەلای ئێمە رێزی هەیە با باوەڕی بە اللّٰهو پێغەمبەریش نەبێتو بانگ کەر بێت بۆ بێدینیو وازهێنان لە

فەرمانەکانی قورئانو سونەتو گاڵتەکەر بێت بە یاساکانی ئیسلام گرنگ ئەوەیە کە جەماوەر وەرمانگرێتو پلەو پایەو خەیرێکی دنیامان دەست کەوێت ، جا بەڵگەش دەهێنینەوە کە ها پێغەمبەر ﷺلەگەڵ بێباوەڕاندا پەیمانو عەهدی بەستوە ئێمەش هەر ئاوەها پەیمانمان بەستوە لەسەر ئەوەی کە هەمومان هاوبەش بین لە دانانی حەڵاڵو حەرام ویاساو رێزنان لە بیرو بۆچونی یەکترو ئەوەش کە بەرەنگاریمان بکات بێ سیاسەتو واقیع نەناسە! بێ ئاگا لەوەی کە دانانی یاسا بۆ مرۆڤ هەر شیاوی ئەو زاتەیە کە دروستی کردونو دەربڕینی بێزاریو رقوقین بەرامبەر بە هەر کوفرێك یان هەر یاسایەك جگە لە قورئانو فەرمودە راستەکانی پێغەمبەر ئەرکی سەرشانیەتیو یەکخواپەرستیو ئیمانی راستەقینە بە بێ ئەوە دانامەزرێتو ئەمە شوێنی مەیلکردنو شیرینزمانی نیە ئەوەتەلەم ئایەتانەدا کەلە مەکەداولەکاتی بێ دەسەڵاتی پێغەمبەر ﷺو موسڵمانانندا هاتوەتە خوارەوە چۆن پەروەردگاری جیهان هەڕەشەی ئاوا نزیك بوونەوەیەك لە پێغەمبەر ﷺدەکاتودەفەرموێ:

(٧٤) خۆ ئەگەر ئێمە تۆمان دامەزراو راگیر نەکردایە لەسەر ئەم ئاینە بەراستی نزیکبو کە کەمێك مەیلی دڵ بکەی بۆلای ئەوان ئەگەر چی مەبەستی تۆ دنیا نەبوە بەڵکو بەهیوای ئەوەی کە ئەوانیش بە نەرمی لەگەڵ تۆدا بجوڵێنەوەو دژایەتیت نەکەنو قسەکانت لێ وەرگرن، بەڵام پەروەردگار تۆی دامەزاوو کرد، جا بۆیە تۆ کەمترین مەیلو نەرمیەکت بەرامبەر بەوان نەنواند.

(٧٥) بەڵام ئەگەر کەمترین مەیلت بکردایە بۆلایان، جا ئەوکاتە ئێمەش سزای چەند بەرامبەری ژیانو چەند بەرامبەری مردنو دوارۆژمان بەسەرتا دەدا لەپاشان تۆ یارمەتی دەرێکت دەست نە دەکەوت کە رێگا لە ئێمە بگرێت لە سزادانت.

(٧٦) جا بەراستی ئەوان خەریکبون تۆ بجوڵێنن لەسەر زەویداو سوکت بکەنو دەرت بکەن، خۆ ئەگەر ئەوەیشیان بەتۆ بکردایەو لەناویان ببردایت باش بزانە کە ئەوانیش نەدەمانەوە پاش تۆ جگە لە ماوەیەکی کەم، واتە: ئێمە تۆڵەمان لێ دەسەندن وئەمان فەوتاندن لەدنیاداو کەس نەی دەتوانی رێگامان بگرێت.

(٧٧) ئەمەیش رەوشتو رێبازی ئەو کەسەیە کە لە پێش تۆدا رەوانەمان کردوە کە رەوانە کردنی سزایە بۆ ئەو گەلانەی کە دژی پێغەمبەرەکەیان بوون ، جا ئەگەر ئەمانیش دەست هەڵ نەگرن لە ئازاردانت بەڵا بەسەر ئەمانیشدا دەهێنینو تۆ دەستت ناکەوێتو نابینی کە رەوشتی ئێمە بگۆرێت، دەڵێن هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بو کافرانی مەکە بڕیاری دەرکردنی پێغەمبەریان دا اللّٰهیش بەم شێوەیە هەڕەشەی لێ کردن بەڵام

ئەوان گوێیان بەهەڕەشەی ﷲ نەداو پێغەمبەریان ﷺدەرکرد لەمەکەو ساڵ ونیوێك زیاتری نەخاوند کە ﷲ بە غەزای "بەدر" تۆڵەی لێ وەرگرتن‌و حەفتا لەگەورە پیاوان‌و پایە بەرزانی وەك ئەبوجهل وعوتبەو شەیبەو ئەبوبەختەری کوژران‌و سام‌و هەیبەتی خوانەناسان لەناو چو، ئینجا ﷲ فەرمان دەدات بەسەر پێغەمبەرماندا ﷺ کەنوێژەکانی لەکاتی خۆیاندا ئەنجام بدات‌و دەفەرموێ:

(٧٨) ئەی محمد ﷺ کاتێك کە خۆر لار دەبێتەوە هەتا تاریکایی شەو نوێژ بکە کە نوێژی نیوەڕۆو عەسرو مەغریب‌و عیشا دەکات، وە قورئان خوێندنەکەی بەیانانیش ئەنجام بدەکە بریتیە لە نوێژی بەیانی بەراستی نوێژی بەیانی کاتی ئامادەبونی فریشتەکانی شەوو ڕۆژە.

(٧٩) جا تۆ لەبەشێکی شەودا هەڵسە بۆ نوێژ کردن ئەوە زیادەیەکەو لەسەر تۆ پێویستە ئەی محمد ﷺ، چونکە نزیکە پەروەردگارت پلەیەکت پێ بدات کەسوپاسکراوبێ‌و هەمو مرۆڤ بە دەستکەوتنی ئەو پلەیە سوپاست بکەن، مەبەست شەفاعەتی گەورەیە کە کاتێك لە هەمو پێغەمبەران نائومێد دەبن کە تکایان بۆ بکەن بۆ ئەوەی کە پەروەردگار لە نێوانیاندا حیساب وکتاب دەست پێبکات‌و لەو دژواریەی مەحشەر رزگاریان ببێت، جا ئەو کاتە پێغەمبەرمان ﷺهەڵدەسێت بەو شەفاعەتە گەورەیە وەك لەفەرمودەی راستدا هاتوەو بەوشێوەیە ﷲ ڕێزی لێدەگرێت‌و ئەو پلەیەی پێدەبەخشێت‌و هەموخەڵکیش سوپاسی دەکەن‌و هەمویان ڕێزو گەورەیی پێغەمبەریانﷺ بۆ دەردەکەوێت‌و دەیناسن ئەگەر چی ئاخر پێغەمبەرە ﷺ.

(٨٠) جا ئەی محمد ﷺبڵێ: ئەی پەروەردگارم بمخەرە شوێنێکی راستی وا کە هەمو شتی تێدابێت‌و پەکم بۆ هیچ نەکەوێت‌و دەرم بکە بەدەرکردنێکی چاك لەو شوێنە چاك‌و راستە کە مەکەیە، جا هەندێك دەڵێن: ئەی پەروەردگارم بممرێنە بەمردنێکی چاك‌و زیندوم بکەرەوە بەزیندوکردنەوەیەکی چاك. وە لە لایەنی خۆتەوە هێزو یارمەتیدەرێکی وام پێبدە کە بتوانم بەسەر دوژمنانی ئایین دا زاڵ ببم،

(٨١) جا بڵێ: حەق هات‌و بەتاڵ فەوتا بێگومان بەتاڵ لەناوچووە، چونکە بەتاڵ بێ‌بنەماو دوور لە هەمو راستیەکانەو لەناوچونی بێگومانە بەڵام بەومەرجەی کە حەق بێت‌و روبەروی بوەستێت. ئیبنو مەسعود دەڵێ:{ دَخَلَ رَسُولُ اللهِ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلم مَكةَ عَامَ الفَتْحِ وَحَوْلَ الكَعْبَةِ ثَلاثُ مِائَةٍ وَستونَ نُصُبًا فَجَعَلَ النبِي صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ يَطْعُنُهَا بِمِخْصَرَةٍ فِي يَدِهِ وَرُبمَا قَالَ بِعُودٍ وَيقُولُ: جَاءَ

وَإِن كَادُواْ لَيَسۡتَفِزُّونَكَ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ لِيُخۡرِجُوكَ مِنۡهَاۖ وَإِذٗا لَّا يَلۡبَثُونَ خِلَٰفَكَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدۡ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِن رُّسُلِنَاۖ وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحۡوِيلًا ﴿٧٧﴾ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمۡسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيۡلِ وَقُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِۖ إِنَّ قُرۡءَانَ ٱلۡفَجۡرِ كَانَ مَشۡهُودٗا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَتَهَجَّدۡ بِهِۦ نَافِلَةٗ لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدۡخِلۡنِي مُدۡخَلَ صِدۡقٖ وَأَخۡرِجۡنِي مُخۡرَجَ صِدۡقٖ وَٱجۡعَل لِّي مِن لَّدُنكَ سُلۡطَٰنٗا نَّصِيرٗا ﴿٨٠﴾ وَقُلۡ جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا ﴿٨١﴾ وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٞ وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنۡعَمۡنَا عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ أَعۡرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦۖ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسٗا ﴿٨٣﴾ قُلۡ كُلّٞ يَعۡمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَنۡ هُوَ أَهۡدَىٰ سَبِيلٗا ﴿٨٤﴾ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٨٥﴾ وَلَئِن شِئۡنَا لَنَذۡهَبَنَّ بِٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِۦ عَلَيۡنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾

الحَق وَزَهَقَ البَاطِلُ إن البَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا جَاءَ الحَق وَمَا يُبْدِئُ البَاطِلُ وَمَا يُعِيدُ /الترمذي، صحه الالبا / واتە پێغەمبەری ئازیزمان ﷺلە کاتی سەرکەوتنی مەکەدا کاتێ کە چووە مەکەوە لەچوار دەوری کەعبەدا سێ سەدو شەست بت دانرا بو بۆ پەرستن کە بە عەساکەی هێماو ئیشارەی بۆ دەکردن‌و دەیفەرمو: ئیسلام هات‌و کوفر لەناوچوو حەق کە هات بەتاڵ‌و بت پەرستی وەك پێش دەست پێناکاتەوەو جارێکی تر وەك خۆی ناگەڕێتەوە. ئینجا دەفەرموێ:

(٨٢) جا ئێمە نازڵمان کردوە لە ئەم قورئانەدا ئەوەی کە شیفایەو ڕەحمەتە بۆ ئیمانداران، وەزاڵمان هیچ سودێك لەم قورئانە وەرناگرن جگە لە زیان ، چونکە بەهۆی دژایەتی قوروانەوە زیاتر ڕەنجەڕۆو خەسارەت مەند دەبن‌و ڕۆژی قیامەتیش پێغەمبەرمان ﷺ شایەتی دەدات لەسەر ئەو کەسانەی کە بە گوێی قورئانیان نەکردوەو دەفەرموێ: ﴿ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا / فورقان: سي.

ئەی پەروەردگارم ئەم گەلەی من وازیان ئا لەم قورئانە هێناوەو ئیشیان پێ نەدەکرد﴾

وە دەبێت بە بەڵگەیەك لە سەریان کەواتە قورئان زیاتر بوو بەهۆی زیان وسزای سەخت بۆ بێباوەڕان بەڵام شیفایە بۆ باوەڕداران هەم شیفای گیانی‌و ڕۆحی هەم شیفای لەش‌و جەستەیی والله اعلم. دایکمان عایشە دەفەرموێت: {أن الن

إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ فَضْلَهُۥ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ ٱجْتَمَعَتِ ٱلْإِنسُ وَٱلْجِنُّ عَلَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِمِثْلِ هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِۦ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰٓ أَكْثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾ وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَـٰرَ خِلَـٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَـٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ ۗ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَـٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾

ﷺكَانَ يَنْفُثُ عَلَى نَفْسِهِ فِي الْمَرَضِ الَّذِي مَاتَ فِيهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ فَلَمَّا ثَقُلَ كُنْتُ أَنْفِثُ عَلَيْهِ بِهِنَّ وَأَمْسَحُ بِيَدِ نَفْسِهِ لِبَرَكَتِهَا/البخاري/ واته:
پێغەمبەر ﷺلەو نەخۆشیەدا کە وەفاتی کرد سورەتی(**الاخلاص**)و (**الفلق**)و (**الناس**) ی دەخوێندو پاشان فوی دەکرد بەناولەپیداو دەیهێنا بەلەشی خۆیدا، جا کاتێك کە نەخۆشیەکەی سەخت بوو من ئەو سورەتانم دەخوێندو فوم دەکرد بەڵام بەهۆی بەرەکەتو پیرۆزی دەستی پێغەمبەر ﷺهەر دەستی خۆیم بە لاشەیدا دەهێنا.

﴿٨٣﴾ خۆ هەر کاتێ نیعمەتی خۆمان ڕژان بەسەر مرۆڤدا پشت تێدەکات وخۆی دوور دەخاتەوە لەسوپاسکردنی ﷻ ، وە هەر کاتێ توشی زیانو ئێش وئازار بو نائومێد ئەبێ وچاوەڕێ ناکات کە جارێکی تر توشی خەیرو خۆشی ببێ ، جا دەفەرموێ:

﴿٨٤﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ هەمو ئیش دەکەن بە شێوەی خووڕەوشتی ناو دەرونی خۆی، دڵو دەرون پاکان کە باوەڕدارانن ئیشیان پاکە، وەدڵو دەرون پیسان کە بێ باوەڕانن ئیشیان خراپە، واتە: دڵتەنگ وغەمگین مەبە لەکاری ناپەسەندی بێباوەڕان، چونکە کارەکانیان وێنەی ناو دەرونی خۆیان دەردەخات ئەوسا پەروەردگارتان زاناترە لە ئێوە بەو کەسەی کە چاکتر ڕێگای هیدایەتی گرتووە هەر کەسێکیش بە گوێرەی کرداری خۆی پاداش دەداتەوە.

﴿٨٥﴾ جا ئەوان لەبارەی ڕوحەوە پرسیارت لێ دەکەن بڵێ: ڕوح شتێکە لە فەرمانی پەروەردگارمو دروستکراوی ئەوەو چونیەتییەکەی هەر لە عیلمی ئەو دایەو من هیچ شتێکی لێ نازانمو ئێوەش خۆتان هەڵمەکێشن، چونکە پێتان نەدراوە لەزانیاری مەگەر شتێکی زۆر کەم، لەهۆی دابەزینی ئەم ئایەتەدا دوو ڕیوایەت هاتوە: یەکێکیان وادەگەیەنێ کە ئەم ئایەتە لەمەدینەدا دابەزی بێت کە ڕیوایەتەکەی عەبدوڵای کوڕی مەسعودە کە (بخاریو مسلم) ڕیوایەتان کردوە کە گوایە جولەکەکان لەبارەی ڕۆحەوە پرسیارەیان لە پێغەمبەری خوا ﷺکرد تابزانن ئایا پێغەمبەرە یان پێغەمبەر نیە بەڵام ڕیوایەتەکەی عەبدوڵای کوڕی عەباس کە ترمزی ڕیوایەتی کردوە دەری دەخات کە ئەم ئایەتە وەك باقی سورەتەکە لەمەکەدا هاتوەتە خوارەوە کە گوایە قورەیشییەکان چوونەتە لای جولەکەکانی مەدینەو باسی پێغەمبەریان بۆ کردونو وتویانە ئایا لەلای ئێوە کە ئێوە خاوەنی پەڕاون شتێك هەیە کەئێمە بتوانین بەوشتە محمد تاقی بکەینەوەو بزانین ڕاستە پێغەمبەرە یان درۆدەکات، جوەکان وتیان: بچن سێ پرسیاری لێ بکەن ئەگەر بەڕاستی وەڵامی دانەوە ئەوە ڕاستە پێغەمبەرە یەکێك لەوپرسیارانە، پرسیاری ڕوح بو کەچیەو چۆنە کەوەڵامیشی بەشێوەی ڕاستدانەوە ئینجا ڕاستی پێغەمبەریان بۆدەرکەوت بەڵام شەیتان سەری لێشێواندنو هەر لەسەر دژایەتی پێغەمبەرﷺ سوربون تا زۆربەیان بەر شیرو تیری موسڵمانان کەوتن لەغەزای "بەدر"دا. وە پاش سەرکەوتنی پێغەمبەرمان ﷺبەسەر مەکەدا ئەوەی کە مابو موسڵمان بونو خزمەتی زۆر گەورەیشیان بە ئایین وپێغەمبەری خوا ﷺکرد خوا لە هەمویان ڕازیبێ. ئینجا ﷻ باسی ئەونیعمەتە گەورەی خۆی کە قورئانە دەکات کە چۆن ناردویەتیە خوارەوە هەرواش دەتوانێت بەرزی بکاتەوەو ئەو نیعمەتە گەورە لە ناو بەندەکانیدا هەڵگرێت جا دەفەرموێ:

﴿٨٦﴾ ئەگەر ئێمە ئارەزۆمان لێ بێت بەڕاستی ئەوەی کە ناردوومانەتە لای تۆ هەموی لەناودەبەین جا هیچی نە لە بیری خۆتداو نە لە بیری کەسی تردا نامێنێت پاشان هیچ پشتیوانێکت دەست ناکەوێو کەس یارمەتیت نادات لە سەر ئەوەی کە نەهێڵێت ئیمە ئاوا بکەین یان بۆت بهێنێتەوە،

﴿٨٧﴾ بەڵام خوا ئەم ئیشە ناکات بەڵکو ئەم قورئانەی ناردوە کە مایەی فەرو خێر بێت تا ئەو کاتەی کە خۆی دەزانێ، بێگومان فەڕوخێری ئەو بەسەر تۆوە ئەی محمد ﷺزۆر گەورەیە کە تۆی

هەڵبژاردووە کردویتی بە پێغەمبەر وئەم قورئانە پڕ خێرو بەرەکەتەی پێداویت.

جا ئێوەش ئەو قورئانە بخوێننەوەو فەرمانەکانی بەجێ بهێنن‌و ئامۆژگاریەکانی وەرگرن پێش ئەوەی کە ﷲ بەرزی بکاتەوەو ئایەتێکی لە سەر زەویدا نەهێڵێت، حوزەیفەی کوڕی یەمان دەڵێ: پێغەمبەر ﷺفەرموی:{ يَدْرُسُ الإِسْلامُ كَمَا يَدْرُسُ وَشْيُ الثَّوْبِ حَتَى لَا يُدْرَى مَا صِيَامٌ وَلَا صَلَاةٌ وَلَا نُسُكٌ وَلَا صَدَقَةٌ وَلَيُسْرَى عَلَى كِتَابِ اللهِ عَزَ وَجَل فِي لَيْلَةٍ فَلَا يَبقَى فِي الْأَرْضِ مِنْهُ آيَةٌ وَتَبْقَى طَوَائِفُ مِنْ النَاسِ الشَيْخُ الكَبِ ُ وَالْعَجُوزُ يَقُولُونَ أَدْرَكْنَا آبَاءَنَا عَلَى هَذِهِ الْكَلِمَةِ لَا إِلَهَ إِلَا اللهُ فَنَحْنُ نَقُولُهَا /ابن ماجە،ا اكم، صححە الالبا / واتە: ئیسلام کەم کەم ڕەنگ وروی نامێنێ وەك لیباس چۆن کۆن دەبێ ئاوای لێ دێت کە نازانرێ کە ڕۆژو چیەو نوێژو قوربانی وچاکە چیە تا شەوێك دێت یەك ئایەتی ئەم قورئانە لەسەر زەویدا نامێنێ کۆمەڵێ پیاوو ئافرەتی پیر دەمێنن کە دەڵێن: کاتی خۆی لەباووباپیرانمانەوەگوێمان لەم وشەی {لااله الا ا } بوە، جا ئێمەش ئەوە دەڵێین. پاشان پەروەردگار باس لە گەورەی ئەم قورئانە دەکات کە کەس ناتوانێت وێنەی بهێنێ‌و دەفەرموێ:

﴿٨٨﴾ پێیان بڵێ: ئەگەر هەمو ئینسان وجنۆکە کۆببنەوە لەسەر ئەوەی کەوێنەی ئەم قورئانە بهێنن ناتوانن وێنەی بهێنن ئەگەر چی هەندێکیان یارمەتی هەندێکیان بدەن، لێرە دا فەرموی وێنەی بهێنن کە نەیانتوانی پاشان فەرموی دە سورەت کە ئەویشیان نەتوانی پاشان فەرموی یەك سورەت بهێنن، ئەویشیان نەتوانی جا چی لەوە گرنگترە کە محمدی نەخوێندەوار پەڕاوەیەك بە زمانی عەرەبی بهێنێت کە هەمو عەرب لەگەڵ هەمومرۆڤێکی ترو تەواوی جنۆکەدا نەیانتوانیوەو ناشتوانن سورەتێك وەك سورەتی ئەو پەڕاوەی ئەو بهێنن لەحاڵێکدا هەوڵی ئەوەیشیان داوەوبەتوندیش دژایەتیانکردوە؟ جا ئەوەی خاوەنی ژیرییەکی ساق بێت دەزانێ ئەو پەڕاوە لە لایەن خوداوە هاتوەو محمدیش ﷺپێغەمبەریەتی بەڵام "ئەگەر ژیری نەما گیان والە سزادا" ئینجا خوای زاناو باڵادەست دەفەمووێ:

﴿٨٩﴾ بەڕاستی ئێمە لەم قورئانەدا لە هەمو وێنەیەکی پێویستو کاریگەرمان هێناوە بۆ خەڵك‌وجێگۆڕکەمان پێکردوە بۆئەوەی ببێت بە پەندوئامۆژگاری بۆیان ورێگای حەق بگرن وپەیڕەوی پێغەمبەر ﷺبکەن بەڵام زۆربەی خەڵك جگە لە بێباوەڕی شتێکی تریان نەویست. بەڵێ ئەوان ئەو هەمو بەڵگە ڕۆشنانەی کە لەو قوئانەدا هەیە وازلێدەهێنن‌و داوای بەڵگەو موعجیزاتی تر دەکەن،

﴿٩٠﴾ خۆ وتیان باوەڕت پێ ناکەین هەتا لەم زەوییەدا کانی ئاوێکمان بۆ هەڵنەقوڵێنیت،

﴿٩١﴾ یان هەتا تۆ خۆت باخچەیەکت نەبێت لەخورماو ترێ کەبە ناویاندا جۆگای ئاو بڕوات چۆن ڕۆیشتنێك،

﴿٩٢﴾ یان وەك تۆ گومانەکەیت کە سزا دێت بەسەرماندا یا لە ئاسمانەوە پارچەیەکی بباریێت بەسەرمان داو لەناومان ببات یان تۆ خواو فریشتەکانمان بۆبهێنە تا ئێمە بەچاوی خۆمان بیان بینین ئەگینا ئێمە باوەڕت پێ ناکەین.

﴿٩٣﴾ یان با تۆ ماڵێکی زۆر ڕازاوەت هەبێت یان تۆ سەرکەوە بۆ ئاسمان کە هەرگیزباوەڕت پێ ناکەین بەوسەرکەوتنەیشت تاتۆ نامەیەکمان بۆ نەهێنی لەلایەن خوداوە کەئێمە خۆمان بیخوێنینەوە؛ ئەی محمد ﷺبڵێ: پاك‌و بێ عەیبە پەروەردگارم من جگە لەوەی کە بنیامێکم‌و نێرراوی ﷲم شتێکی ترنیم ،واتە، بڵێ: ئەو شتانەی کە داوای دەکەن لەمن ئەوە ئیشی من نیەو من تەنها گەیاندنی پەیامی خودام پێ سپێرراوە کێ باوەڕ دەهێنێ سودی بۆ خۆیەتی‌و کێش باوەڕم پێ ناکات زیانی بۆخۆیەتی.

﴿٩٤﴾ هەر کاتێ پێغەمبەرو ڕێنمای هاتوە بۆ خەڵك جگە لەوقسەیەی کەدەیان وت: چۆن دەبێت بەشەرێك پێغەمبەربێت هیچ شتێکی تر نەبوە کە بەرگری لە خەڵکە بکات بۆ باوەڕ هێنان‌و تەنها هەر ئەو بهانەیان هەبوە جا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٩٥﴾ پێیان بڵێ ئەگەر لەسەر زەویدا فریشتەکان بەئارام هاتوچۆیان بکردایەو ئەوانی تێداسەقام گیر بوایە وەك ئێوە بەڕاستی ئەو کاتەش ئێمە لە ئاسمانەوە فریشتەمان دەکرد بە پێغەمبەرو ڕەوانەمان دەکردە سەر ئەو فریشتانە، جا بت پەرستەکان وتیان: ئەی محمد ﷺکێ شایەتە لەسەر ڕاستیت؟ خوایش فەرموی:

﴿٩٦﴾ بڵێ: بەسە کە ﷲ شایەت بێت لەنێوان من‌وئێوەدا کە ئەوەی من ئەڵێم لەلایەن ئەو زاتەیە، بەڵام ئەوەی کەئێوە ئەیڵێن هەموی درۆو بختیانە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەوەی کە بەندەکانی دەیلێن‌و بینەری هەمو هەڵس وکەوتەکانیانە، کەوابو تۆ نارەحەت مەبەو دڵ تەنگ مەبە چونکە بەڕاستی هیدایەت‌و ڕێنمای هەر بەدەست ئەو زاتە خۆیەتی.

﴿٩٧﴾ جا ئەو کەسەی کەﷲ ڕێنمای بکات هەر ئەوەیە ڕێگای ڕاستی گرتوە چونکە خۆی ڕێنمایی ویستوە، وە هەر کەسێکیش کەخوا گومڕاهی بکات جگە لەو زاتە کەسیکی ترنییە دۆست

وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾

ویارمەتی دەری بێتو ڕێگای ڕاستی پیشان بدات وله ڕۆژی ڕاست بوونەوەیشدا هەمو گومڕاهان بەسەر دم وچاویاندا لەحاڵێکداکە کەڕنو هیچ نابیستنو کوێرنو کەس نابیننو لاڵنو توانای قسە کردنیان نییە کۆ دەکەینەوە کە شوێنی ئەوان دۆزەخەو هەر کاتێك ئاگرەکەی کز و هێواش ببێت ئێمە ئاگریان لێ هژدەدەین وبڵێسەدارتری دەکەین،

(٩٨) ئەوە پاداشتی ئەوانە چونکە ئەوان بێباوەڕبون لەدنیادا بەئایەتەکانی ئێمەو دەیان وت: ئایاکاتێك کە ئێمە مردینو بوین بە ئێسقانو ڕزین ئایا تازە زیندو دەبینەوەو دەبین بەدروستکراوێکی تازە؟ جا ئەگەر خاوەن عەقڵو فامن پێش ئەوەی کە بگەن بەو سزاگەورەو پڕمەترسییە هەر ئێستا تەماشای ئەم بونەوەرەبکەنو بیر بکەنەوەو ڕوو بکەنە پەروەردگاری خۆتانو تەوبەیەکی چاك بکەن، ﷲ میهرەبانو لێبوردەیە.

(٩٩) ئایا نابینن ونازانن ئەو ﷲیەی کە ئاسمان وزەوی بەو گەورەیو عەزەمەتەوە دروستکردوە دەسەڵاتی هەیە لەسەر ئەوەی کە دووبارە لە پاش مردنیان وەك وێنەی خۆیان دروستیان بکاتەوە، جا ﷲ ماوەیەکی دیاری کراوی داناوە بۆ زیندو کردنەوەیان کە هیچ گومانێکی تێدانیە، جا ستەمکاران خۆیان دەبوێرنو ماوە بەخۆیان نادەن مەگەر بۆ بێباوەڕ بون؛ واتە، موشریكو بت پەرستان هەر بێباوەڕی هەڵدەبژێرن بۆخۆیان.

(١٠٠) ئەی محمد ﷺپێیان بڵێ: بەڕاستی ئەگەر ئێوە خاوەنی هەمو خەزێنەکانی ڕەحمەتی پەروەردگاری من بن ئێوە دەستیان پێوە دەگەرن لەترس نەداریو فەقیری بەڕاستی ئینسان ڕژدو بەخیلەو دەستی ناچێتە ماڵی خۆیو مافی مافداران نادات مەگەر خوا بە لوتفی خۆی لەو سیفەتە خراپە پاکی کردبێتەوە، ئەوانەش زۆر کەمن. جا ئەی محمد ﷺ وانەزانی کە تۆ یەکەم نێرراوی خوایت کە بەو هەمو بەڵگە ڕۆشنانەوە بەدرۆت دەخەنەوەو باوەڕت پێ ناکەن،

(١٠١) بەڕاستی ئێمە دامان بە موسا نۆ نیشانەی ڕۆشن بۆ ئەوەی فیرعەونو پەیڕەوانی باوەڕی پێ بکەنو دژایەتی نەکەن وەك عەساکەیو دەستیو ساڵە گرانیو کەم بونەوەی بەروبوومو تۆفان وکوللەو ئەسپێو بۆقو خوێن کە هەر کام لەوانە بەسبو بۆ کەسێك کە بە شوێن حەقدا بگەڕایە، خۆ جوەکان بەسەرهاتی موساو فیرعەون دەزانن، جا پرسیار بکە لەوان کاتێك کە موسا هاتە لایان خۆ فرعەونیش پێی وت: بەڕاستی من وا گومان دەکەم ئەی موسا تۆ جادوت لێ کراوە.

(١٠٢) موسایش وتی: بەڕاستی تۆ چاك دەزانیت هیچ کەسێك ئا ئەمەی ڕەوانە نەکردوە جگە لەپەروەردگاری ئاسمانان وزەوی کە بەرچاو ڕۆشنکەرەون بۆ هەرکەسێك کە بییەوێت ڕێگای ڕاست بدۆزێتەوە، ئەوسا بەڕاستی منیش وادەزانم ئەی فیرعەون تۆ لە ناوچوو فەوتاوی چونکە زۆر چاك دەزانی کە من نێرراوی پەروەردگارمو دژایەتیم دەکەیت، واتە: ئەی ئەوانەی کە ئێستا دژایەتی من دەکەن ئێوە کە موسا بەڕاست دەزانن خۆ کاتی خۆی موسایش ئاوای پێوتراوەو بە ناحەق بەدرۆ خرایەوە دەی ئەمڕۆ ئێوە بۆچی چوونەتە جێگای فیرعەونو دژایەتی من دەکەن؟!

(١٠٣) جا فیرعەون ویستی موسا وجەماعەتەکەی لەم سەر زەوییەدا سووك بکاتو ناچاریان بکات بەپەیڕەوی کردنی خۆی یان دەریان بکات، جا ئێمەش لەبەر ئەوە فیرعەونمان لە ناو دریادا غەرق کرد لەگەڵ هەمو ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدا بون.

(١٠٤) جا لە دوای غەرقبونی فیرعەون گوتمان بەنەوەکانی یەعقوب ئێوە لەو زەوییەی شامو میسردا بۆ خۆتان دابنیشنو ئاوەدانی بکەنەوە، جا هەر کاتێ کاتی بەڵێنی دوایی هات هەموتان کۆ دەکەینەوەو هەموتان سزا دەدەین.

(١٠٥) جا بە مەبەستێکی ڕاست ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردوەو ڕەوانە کردنیشی بە حەق بوەو لە هەمو شەیتانێكو لە هەمو زیادو کەمێك پارێزڕاو بوەو بۆ مەبەستو بەرنامەیەکی ڕاست

وَبِٱلۡحَقِّ أَنزَلۡنَٰهُ وَبِٱلۡحَقِّ نَزَلَۗ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿١٠٥﴾ وَقُرۡءَانٗا فَرَقۡنَٰهُ لِتَقۡرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكۡثٖ وَنَزَّلۡنَٰهُ تَنزِيلٗا ﴿١٠٦﴾ قُلۡ ءَامِنُواْ بِهِۦٓ أَوۡ لَا تُؤۡمِنُوٓاْۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِۤ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَلَا تَجۡهَرۡ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتۡ بِهَا وَٱبۡتَغِ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلٗا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي لَمۡ يَتَّخِذۡ وَلَدٗا وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٞ فِي ٱلۡمُلۡكِ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلِيّٞ مِّنَ ٱلذُّلِّۖ وَكَبِّرۡهُ تَكۡبِيرَۢا ﴿١١١﴾

## ١٨ سُورَةُ الكَهۡفِ ١١٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ﴿١﴾ قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدٗا ﴿٣﴾ وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا ﴿٤﴾

هاتووە تۆمان رەوانە نەكردوە مەگەر بۆ ئەوەی كە مژدە دەربیت بۆ چاكەكاران‌و ترسێنەر بیت بۆ خراپەكاران.

﴿١٠٦﴾ خۆ ئەمە قورئانێكە بەش بەشمان كردوە و بەگوێرەی پێویست لە ماوەی بیست وسێ ساڵ دا ناردومانەتە خوارەوە تا تۆش بیخوێنی بەسەر خەڵكا بەهێواشی‌و تا ئەوانیش بتوانن وەری بگرن‌و لێی تێبگەن‌و ئیشی پێ بكەن ، جا دامان بەزاندوە چۆن دابەزاندنێك رێك‌وپێك‌و بەش بەش‌و یەك بەدوای یەك لەو ماوە درێژەدا بە بێ ئەوەی كەهەڵەو نارێكییەكی تێدا بێ.

﴿١٠٧﴾ پێیان بڵێ: بەم قورئانە كە سودی دنیاو دینتانە ئیمان بهێنن یان ئیمانی پێ نەهێنن پەروەردگار هیچ زیانێك ناكات‌و لە راستی ئەم قورئانەیش كەم ناكاتەوە ، بێگومان ئەوانەی كە زانیاری راستەقینەیان پێدراوە لە پێش ئەم قورئانەدا ولەسەر ئەو باوەڕە ماون هەر كاتێك ئەم قورئانە بخوێنرێ بەسەریاندا دەكەون بەسەر چەناكەیانداو سوجدەی شوكر دەبەن بۆ ﷲ كە گەیشتن بە ئەم پێغەمبەرەیﷺكە مژدەی هاتنی بەوان درابو.

﴿١٠٨﴾ جا دەڵێن: پاك وبێ عەیبی بۆ پەروەردگارمان بێگومان كە بەڵێنی پەروەردگارمان جێبەجێ كراوە.

﴿١٠٩﴾ ئەوسا ئەكەون بەسەر چەناكەیانداو سوجدە ئەبەن وئەگرین‌و گەردن كەچی فەرمانەكانی ﷲ دەبن، وەئەم قورئانە زیاتر گەردنكەچییان بۆ پەیدا دەكات، ئا ئەمە سیفەتی ئەوكەسانەیە كە كیتابیان بۆ هاتوە لە پێشداو باوەڕیان پێ كردوەو ماون تا ئەم پێغەمبەرەیانﷺ دیوەو باوەڕیان پێهێناوە.

﴿١١٠﴾ بڵێ: بانگ بكەنە ﷲ یان بانگ بكەنە رەحمان هەر كام لەو دوو ناوە بانگ بكەن فەرقی نیە ، چونكە هەردووناوی ئەو زاتەن، وە بۆ ئەوزاتە هەیە چەندین ناوی جوان تر ، واتە: خوا تەنها یەك ناوی نیە بەڵكو ناوی زۆرن‌و بەهەر ناوێك بانگی بكەیت چاكە، وە لە كاتی نوێژ كردنت دا دەنگ بەرز مەكەرەوە بە قورئان خوێندن تا بت پەرستەكان گوێیان لێ نەبێ‌و قسەی ناشیرینت پێ بڵێن‌و زۆریش دەنگت هێواش مەكەرەوە با موسڵمانانی دەوروبەرت بیبیسن، جا لە نێوان دەنگ هەڵبڕینێكی توندو هێواشییەكی زۆر رێگای ناوەندی هەڵبژێرە نەزۆر توندو نە زۆر هێواش.

عەبدوڵای كوڕی عەباس لەبارەی هۆی دابەزینی ئەم ئایەتەوە دەڵێ:{ **نَزَلَتْ وَرَسُولُ اللهِ ﷺ مُخْتَفٍ بِمَكَةَ كَانَ إذَا صَلى بِأصْحَابِه رَفَعَ صَوْتَهُ بِالقُرْآنِ فَإذَا سَمِعَهُ الْمُشْرِكُونَ سَبوا الْقُرْآنَ وَمَنْ أنْزَلَهُ وَمَنْ جَاءَ بِهِ فَقَالَ اللّهُ تَعَالى لِنَبِيهِ ﷺ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ أيْ بِقِراءَتِكَ فَيَسْمَعَ الْمُشْرِكُونَ فَيَسُبوا القُرْآنَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا عَنْ أصْحَابِكَ فَلَا نُسْمِعُهُمْ وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا**./منفق علیه/ واتە: ئەو كاتەی كە پێغەمبەری خوا ﷺخۆی دەشاردەوە لەبت پەرستەكان وهێشتا بانگەوازەكەی ئاشكرا نەبو كاتێ كە نوێژی دەخوێند بۆ هاوەڵانی‌و بە دەنگی بەرزەوە قورئانی دەخوێند، جا كە بت پەرستەكانی قورەیش دەیان بیست جنێویان دەدا بەوەی كەرەوانەی كردوەو بەقورئان‌و بەو كەسەش كە هێناویێتی؛ جا ﷲ فەرموی بە پیغەمبەرەكەی ﷺ دنگت بەقورئان خوێندنەوەكەی ناونوێژت ئەوەندە بەرز مەكەرەوە كە بت پەرستان بیبیسن‌و جنێو بەقورئان بدەن‌و ئەوەندەش هێواشی مەكە كەیارەكانت نەیبیسن بەڵكو لەونێوانەدا بیخوێنە}.

﴿١١١﴾ ئەوسا بڵێ: سوپاس بۆ ئەو ﷲیەی كە منداڵی بۆ خۆی دانەناوەو نیازی پێی نیە ولەم بوونەوەرەگەورەو لەو هەمو موڵكەدا شەریك‌و هاوبەشێكی نیەو رازی بە هاوبەشیش نیە ، وە هیچ یارمەتی دەرو دۆستێكی نییە كە لەناچاریدا نیازی پێی هەبێ ، ئەگینا باوەڕدارانی بە میهرەبانی‌و چاكەی خۆی بە دۆستی خۆی دادەنێت، وە خوای خۆت بە گەورە رابگرە گەورەییەكی وا كە هەمو بەرزی‌و رێزو وەسفی جوانی تێدابێت‌و بە شێوەیەك رەفتار بكە كە گەورەی‌و دەسەڵاتی خودای تێدا دەركەوێت.

## ١٨ سورەتی کەهف ١١٠

سورەتی(الكهف) کە سورەتی هەژدەهەمی قورئانە سەدو دە ئایەتەو لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستو حەوتەمەو پاش سورەتی (الغاشية) وپێش (الشورى) دابەزیوە. لەبارەی گەورەیی ئەم سورەتەدا چەندین فەرمودە هاتوە، ئەبو سەعیدی خودری دەڵێت: پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:{ مَنْ قَرَأَ سُورَةَ الْكَهْفِ يَومِ ا ُمُعَةِ أضاءَ له مِن النور مَا بَ َ الْجُمُعَتَ ِ.‌/ البيهقي، صحه الالبا / واتە: هەر کەسێك لەرۆژی جومعەدا سورەتی (کەهف) بخوێنێت ئەوە نورو بەرچاو رۆشنیەکی بۆ هەیە لە نیوان ئەو دوو جومعەدا}. وەهەروەها پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {مَنْ حَفِظَ عَشْرَ آياتٍ مِنْ أول سُورَةِ الْكَهْف عُصِمَ مِنْ الدجال/مسلم وغ ه/ واتە: هەرکەسێك دە ئایەت لە سەرەتای سورەتی (کەهف)دا لەبەر بکات لە کێشەو بەڵای "دەجال" دەپارێزرێت}.

وتراوە لەبەر ئەوەیە چونکە ئەو ئایەتانە باس لە شتانی عەجیبو سەرسوڕهێنەری وەك یارانی ئەشکەوت دەکەن، جا هەر کەس لەوانە ورد ببێتەوە هێزو دەسەڵاتی (ﷲ)ی زۆرتر بۆ دەردەکەوێتو ئیشو کردەوەکانی دەجالی لاعەجیبو غەریب نیە. نەواسی کوری سەمعان دەڵێت: جارێك کە باسی دەجالمان دەکرد پێغەمبەرﷺفەرموی: {غَيْرُ الدجالِ أَخْوَفُنِي عَلَيْكُمْ إِنْ َيخْرُجْ وَأَنا ِفيكُمْ فَأَنا حَجِيجُهُ ُدونَكُمْ وَإِنْ َيخْرُجْ وَلَسْتُ ِفيكُمْ فَامْرُؤٌ حَجِيجُ َنفْسِهِ وَاللهُ خَلِيفَتِي عَلَى كُل ُمسْلِمٍ إِنهُ شَاب قَطَطٌ عَيْنُهُ طَافِئَةٌ كَأَني أُشَبهُهُ بِعَبْدِ الْعُزى ْبنِ قَطَنٍ فَمَنْ أَدْرَكَهُ ِمنْكُمْ فَلْيَقْرَأْ عَلَيْهِ فَوَاتِحَ سُورَةِ الْكَهْفِ إِنهُ خَارِجٌ خَلةً َبيْنَ الشأمِ وَالْعِرَاقِ فَعَاثَ َيمِينًا وَعَاثَ ِشمَالًا َيا عِبَادَ اللهِ فَاثْبُتوا قُلْنا َيا رَسُولَ اللهِ وَما لَبْثُهُ ِفي الْأَرْضِ قَالَ أَرْبَعُونَ َيوْمًا َيوْمٌ كَسَنَةٍ وَيَوْمٌ كَشَهْرٍ وَيَوْمٌ كَجُمُعَةٍ وَسَائِرُ أَيامِهِ كَأَيامِكُمْ قُلْنا َيا رَسُولَ اللهِ فَذَلِكَ الْيَوْمُ الذِي كَسَنَةٍ أَتَكْفِينا ِفيهِ صَلَاةُ َيوْمٍ قَالَ لَا اقْدُرُوا له قَدْرَهُ قُلْنا َيا رَسُولَ اللهِ وَما إِسْرَاعُهُ ِفي الْأَرْضِ قَالَ كَالْغَيْثِ اسْتَدْبَرَتْهُ الريحُ فَيَأْتِي عَلَى الْقَوْمِ فَيَدْعُوهُمْ فَيُؤْمِنُونَ بِهِ وَيَسْتَجِيبُونَ له فَيَأْمُرُ السماءَ فَتُمْطِرُ وَالْأَرْضَ فَتُنْبِتُ فَتَرُوحُ عَلَيْهِمْ سَارِحَتُهُمْ أَطْوَلَ مَا كَانَتْ ذُرًا وَأَسْبَغَهُ ضُرُوعًا وَأَمَدهُ خَوَاصِرَ ثُم َيأْتِي الْقَوْمَ فَيَدْعُوهُمْ فَيَرُدونَ عَلَيْهِ قَوْلَهُ فَيَنْصَرِفُ عَنْهُمْ فَيُصْبِحُونَ ُممْحِلِ َ لَيْسَ بِأَيْدِيهِمْ شَيْءٌ ِمنْ أَمْوَالِهِمْ وَيَمُر بِالْخَرِبَةِ فَيَقُولُ لَهَا أَخْرِجِي كُنُوزَكِ فَتَتْبَعُهُ كُنُوزُهَا كَيَعَاسِيبِ النحْلِ ثُم َيدْعُو رَجُلًا ُممْتَلِئًا شَبَابًا فَيَضْرِبُهُ بِالسيْفِ فَيَقْطَعُهُ جَزْلَتَيْنِ رَمْيَةَ الْغَرَضِ ثُم َيدْعُوهُ فَيُقْبِلُ وَيَتَهَللُ وَجْهُهُ َيضْحَكُ فَبَيْنَمَا هُوَ كَذَلِكَ إِذْ َبعَثَ اللهُ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ فَيَنْزِلُ عِنْدَ الْمَنارَةِ الْبَيْضَاءِ شَرْقِي ِدمَشْقَ َبيْنَ مَهْرُودَتَيْنِ وَاضِعًا كَفيْهِ عَلَى أَجْنِحَةِ مَلَكَيْنِ إِذَا طَأْطَأَ رَأْسَهُ قَطَرَ وَإِذَا رَفَعَهُ َتحَدرَ ِمنْهُ جُمَانٌ كَاللؤْلُؤِ فَلَا َيحِل ِلكَافِرٍ َيجِدُ رِيحَ َنفَسِهِ إِلا مَاتَ وَنَفَسُهُ َينْتَهِي حَيْثُ ُينْتَهِي طَرْفُهُ فَيَطْلُبُهُ حَتى ُيدْرِكَهُ بِبَابِ لُد فَيَقْتُلُهُ/مسلم وغ ه/ واتە: من لە شتێکی تری جگە لە دەجاڵ لێتان دەترسم ئەگەر هاتو دەجاڵ دەرکەوتو من لە ناو ئێوەدا بوم ئەوسا من لە جیاتی ئێوەدا دەمکوتی دەکەم، وە ئەگەر هاتو منیش لە ناو ئێوە دا نەبوم، جا ئەو رۆژە هەر کەس دەبێت خۆی پارێزگاری لە خۆی بکاتو لەپاش خۆم (ﷲ) چاودێرە بەسەر هەمو موسڵمانێکدا، وە بزانن کە دەجاڵ گەنجێکی پرچ گرژەو چاوێکیشی دەرپەڕیوەو کوێرە بەلای منەوە ئەو وەکو عەبدولعوزای کوڕی قەتەنە، جا هەرکەس لە ئێوە بەو گەیشت با سەرەتای سورەتی (کەهف)ی بە سەردا بخوێنێتەوە. دەجاڵ لە شوێنێك لەنێوان شامو عێراق دا دەر دەکەوێت، جا بە راستو چەپدا خراپەو تاوان بڵاو دەکاتەوە، ئەوسا ئەی بەندەکانی (ﷲ) ئەو کاتە خۆگر بن لەسەر ئایین، وتمان: ئەی پێغەمبەرﷺلە سەر زەوی دا چەندێ دەمێنێتەوە؟ پێغەمبەرﷺفەرموی: چل رۆژ، رۆژێکی وەك ساڵێكو رۆژیکیشی وەك مانگێكو رۆژێکی تریشی وەك هەفتەیەك وایە ئەو رۆژەکانی تری هەر وەك رۆژانی ئێوە وایە ـ واتە: ساڵێكو دوو مانگو چواردە رۆژ ـ وتمان: ئەی پێغەمبەرﷺ لەو رۆژەدا کە وەك ساڵێك وایە نوێژی رۆژێك بکەین بەسە؟ پێغەمبەرﷺفەرموی: نەخێر، کاتیان بۆ دیاری بکەنو بە پێی ئەو کاتانە نوێژەکانتان بخوێنن. وتمان: ئەی پێغەمبەرﷺ خێرایی رۆیشتنی چۆنە بە سەر ئەم زەویەدا؟ فەرموی: وەك بارانێك وایە کە با بە سەر زەویدا بیفڕێنێت، جا دەگات بە گەلێكو بانگیان دەکاتو ئەوانیش باوەڕی پێ دەهێننو پەیڕەوی دەکەن، ئینجا فەرمان دەکات بە ئاسمان ئەوسا ئاسمانیش باران دەبارێنێتو فەرمانیش دەکات بە زەوی، زەویش گژوگیا سەوز دەکات، مەڕو ماڵاتیان کە ئێواران دێنەوە پشتو کۆپانیان بەرزترەو گوانەکانیان پڕ شیرترەو ئەوەندە لەوەڕیان خواردوە کە کەلەکەیان دەرپەڕیوەو پانو ئەستور بوە، واتە: ئەوانەی کە باوەڕی پێ دەهێنن لەو کاتە تەنگانەدا بەداوای دەجاڵ نازو نیعمەتێکی زۆریان بە سەردا دەرژێتو بانگەوازی گەلێکیش دەکات کە باوەڕی پێبهێننو بیپەرستن بەڵام ئەوان بەرپەرچی دەدەنەوە، جا ئەو گەلە هەرکە رۆژیان لێ دەبێتەوە هیچیان بە دەستەوە نامێنێت ئەوسا دەجال بەلای وێرانەیەکدا تێدەپەڕێتو دەڵێت: ئادەی خەزێنەکانت بکەدەرەوە بەپەلە هەمو خەزینەکانی ئەو شوێنە دوای دەجال دەکەون هەر وەك چۆن مێش هەنگە نێرەکان بە شوێن شاژنە گەورەکەیاندا بە کۆگایو بەخێرای دەردەچن، پاشان بانگی گەنجێکی تازە پێگەیشتو دەکات کە

بیپەرستێت بەڵام ئەویش بەرپەرچی دەداتەوە جا دەجالیش دەیکا بە دوولەتی جیا لەیەك وەك لێدانی نیشانە پاشان زیندوی دەکاتەوەو بۆ جارێکی تر بانگی دەکات کە باوەڕی پێبکاتو بە خوای بزانێت جا بە رویەکی گەشاوەوە روبەڕوی رادەوستێتو پێی پێدەکەنێت، ئینجا لەو کاتەدا عیسای کوڕی مریەم لە لای مەنارەی سپی رۆژهەڵاتی دیمەشقەوە، لە حاڵێکدا کە دوو بەرگی زافەرانی لەبەر دایەو دەستەکانی خستوەتە سەر باڵی فریشتەوە دادەبەزێتە خوارەوە کاتێك کەسەری خوار دەگرێت ئارەق لە سەری دەتکێت وکاتێك بەرزی دەکاتەوە وەك دانەی مرواری بە رومەتی دا دێتە خوارەوە و هەر کافرێك هەناسەی عیسا کە تا چاو بڕ دەکات دەڕوات، پێی بگات دەمرێت، ئینجا عیسا دەڕوات بە شوێنی دەجال داو لە شاری "لود" کە شوێنێکی نزیك بە"بەیتولموقدەس"ـە دەی کوژێت} جا تەماشا بکەن ئەو رووداوەی دەجال چەند پڕ مەترسیو سامناکە خۆ ئەمڕۆ زۆربەی خەڵك پەیڕەوی کەسانێك دەکەنو لێیان دەترسن کە زۆر زۆر لە دەجال لاوازترن کەوابو دەبێ بزانین کە فیتنەی دەجال فیتنەیەکی گەورەیەو خۆ پاراستن لێی زۆر دژوارە، بەڵام باوەڕداران سورەتی (**کەهف**)یان پێدراوە کە چەکێکی گەورەی وایە کە دەجال لە ئاستی دا زۆر لاوازە. وە ئەمەش بەڵگەیەکی ترە دژی بەرژەوەندی پەرستان چاك وردبەرەوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوپاسی بێ وێنەو شایستە پێش کەش بەزاتی (اللّٰه) کە ئەو پەراوەی کە هیچ نارێکیەکی تێدانیە، رەوانە کردوەتە سەر بەندەی خۆی. پێشەکی خوای زاناو کار بەجێ بە سوپاسی خۆی سورەتەکە دەست پێ ئەکات تا ئێمەش فێری داب‌ورەوشتی جوان بکات، وە کارەکانمان هەر بەناوی خواو سوپاسی ئەو زاتەوە دەست پێ بکەین،

(٢) بەڵکو زۆر بتەو بەرێزەو زۆر راست ورێك وپێكو بەنرخە تا بێباوەڕان بترسێنێ لە سزایەکی زۆر توند لەلایەن (اللّٰه)وەو موژدە بدات بەو باوەڕدارانەی کە ئیشی چاك ئەکەن کە بەراستی بۆ ئەوان پاداشتێکی جوانو گەورە هەیە کە بریتیە لەو بەهەشتە پڕ نازو نیعمەتەی کە،

(٣) بۆ هەمیشە لە ناویدا ئەمێننەوە.

(٤) جا تا بترسێنێت ئەوکەسانەی کەئەڵێن (اللّٰه) منداڵی هەیە.

(٥) نە خۆیانو نە باوباپیرانیان هیچ زانیاریەکیان لەم بارەوە نیەو نەبوە تەنها بە گۆترەولەخۆیانەوە لە وەسفی ئەو زاتە گەورەدا قسە دەکەن، وە ئەو قسەیەش وشەیەکی گەورەیە کەلە

مَّا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٖ وَلَا لِأٓبَآئِهِمۡۚ كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا ﴿٥﴾ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴿٦﴾ إِنَّا جَعَلۡنَا مَا عَلَى ٱلۡأَرۡضِ زِينَةٗ لَّهَا لِنَبۡلُوَهُمۡ أَيُّهُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيۡهَا صَعِيدٗا جُرُزًا ﴿٨﴾ أَمۡ حَسِبۡتَ أَنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡكَهۡفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُواْ مِنۡ ءَايَٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذۡ أَوَى ٱلۡفِتۡيَةُ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ فَقَالُواْ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةٗ وَهَيِّئۡ لَنَا مِنۡ أَمۡرِنَا رَشَدٗا ﴿١٠﴾ فَضَرَبۡنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمۡ فِي ٱلۡكَهۡفِ سِنِينَ عَدَدٗا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِنَعۡلَمَ أَيُّ ٱلۡحِزۡبَيۡنِ أَحۡصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓاْ أَمَدٗا ﴿١٢﴾ نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ﴿١٣﴾ وَرَبَطۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾

دەمیان دەردەچێت کە ماڵی پاشە رۆژی خۆیانی پێ کاول ئەکەن، چونکە ئەمانە جگە لە درۆ شتێکی تر ناڵێن. ئینجا پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبەرمانﷺئەکات لەسەر ئەو بێباوەڕییەو ئەوقسە پوچانەی گەلەکەیو ئەفەرموێ:

(٦) خەریکە لە داخو خەفەتدا گیانی خۆت دەربهێنیو خۆت لەناوبەری لەسەر ئەوەی کە ئەوان بەم قورئانە باوەڕ ناهێنن، واتە: ئاوا خۆت ناڕەحەت مەکە تۆ بانگە وازی خۆت راگەیەنەو بەس. ئێمە دەتوانین هەموویان بکەین بە باوەڕدار بەڵام ئێمە لەدنیادا مرۆڤو جنۆکەمان بۆ تاقی کردنەوە دروستکردوە هەر بۆیە سەرپشکمان کردوون لە هەڵبژاردنی ئاییندا تا لە قیامەتدا هیچ بەهانەیەکیان نەبێت.

(٧) بێگومان ئێمە ئەوەی لەسەر زەویدایە تەنها بۆرازاندنەوەو جوانکردنی زەوی دامان ناون تا تاقیان بکەینەوە کە کامیان ئیشی چاکتر ئەکەن، واتە: کامیان ئیشەکانیان خاوێنترو گونجاوترە لە گەڵ ئاییندا. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: { **إن الدُّنيا خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ فَاتقُوها وَاتقُوا النسَاءَ** / ابن خز ة، صحح الالبا / بەڕاستی دنیا دیمەن سەوزو تام شیرینە، جا خۆتانی لێ بپارێزنو وریابن فریوتان نەدات، وە لە فێڵو تەڵەکەی ژنانیش خۆتان بپارێزن} بەڵێ ژیان لەم دنیادا تام شیرنو بە رواڵەت جوانە بەڵام زۆر نابات کۆتایی دێت وەك دەفەرموێ.

(٨) جا ئێمە دووبارە ئەوەی کە لەسەر زەویدایە لای ئەبەین‌و ئەیکەین بە زەوییەکی وشکی بێ گیاو رەش‌و روت. ئەوسا مرۆڤ وجنۆکە دێنەوە بەر دەستمان‌و ئێمەش لێکۆڵینەوەیان لەگەڵدا دەکەین‌و ئەنجامی ئەو تاقی کردنەوەی سەر زەوییەیان بۆ دەردەخەین، جا یان بەهەشت یان دۆزەخ جێگەیان دەبێ، ئینجا خوای زاناو بەدەسەڵات باسی یارانی ئەشکەوت دەکات‌و دەفەرموێ:

(٩) ئەی محمد ﷺ تۆ وا ئەزانی کە بەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت‌و رەقیم کە لە نیشانەکانی زانایی ودەسەڵاتی ئێمەن سەرسوڕهێنەرو عەجیبە؛ ئێمە شتی زۆر گرنگ‌و گەورەترو عەجیب ترمان هەیە وەك دروستکردنی ئاسمان وزەوی‌و مانگ‌و ئەستێرەکان‌و ڕاگیرکردنی هەموویان لە بۆشاییداو جموجوڵیان بەگوێرەی بەرنامەی دیاری کراو بۆیان هەتا کاتی دیاری کراو، جا مەبەست ئەوە نییە کە بە سەرهاتی یارانی ئەشکەوت شتێکی گەورەو عەجیب نیە بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە تێمان گەیەنێت کە نیشانەکانی دەسەڵات‌و هێزی پەروەدگار هەر ئەمە نیە بەڵکو زۆرن. لەسەر وشەی {الرقيم} قسە زۆر کراوەو هەندێك هەر بەو نوسینەی ئەزانن کە لەسەر ئەشکەوتەکەدا نوسراوە هەندێك ئەڵێن: مەبەست ئەو سێ کەسەیە کە پێغەمبەرمان باسی کردون کە کاتێ لەناو ئەشکەوتێك دا بون بەهۆی تەپینی دەروازەی ئەشکەتەکەوە بەردێکی گەورە کەوتە دەمی ئەشکەوتەکەو ڕێگای هاتنە دەرەوەیان لێگیرا پاشان هەر یەکەیان پاکترین وراسترین کردەوەی خۆی هەڵبژاردو داوای لە (اللَّهُ) کرد بە هۆی ئەو کردارەیەوە دەرگایان لێ بکاتەوە، جا کە وایان کرد بۆ هەر یەکەیان کەمێ لە دەرگاکە دەکرایەوەو لە سێهەمدا وای لێ هات کە بێنە دەرەوە، هەندێك ئەڵێن: ناوی ئەو شیوەیە کە بەرەو ئەشکەوتەکە ئەڕوات وە چەند قسەی تر، ئینجا پەروەردگار لەبارەی داستانی یارانی ئەشکەوتەوە دەفەرموێ:

جا کاتێك ئەو کۆمەڵە گەنجە بەرەو لای ئەشکەوتەکە ڕۆیشتن‌و وتیان: ئەی پەروەرگارمان لەلایەن خۆتەوە رەحمەت‌و سۆزی خۆتمان بۆ بنێرەو ئەوەی کە خەیری ئێمەی تێدایە بۆمان بکە، ئەمانە کۆمەڵە گەنجێك بوون کە وازیان لە ڕێبازی هەڵەی باوباپیرانیان هێناو گەلەکەی خۆیانیان بەجێ هێشتوەو ئێستا پەنایان هاوردوەتە ناو ئەو ئەشکەوتەو بەم شێوەیە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، جا پەروەردگاری بەسۆز وەڵامی دانەوەو فەرموی :

(١١) ئێمە ئەوانمان بۆ چەند ساڵێکی ژمێرراو لەو ئەشکەوتەدا خەواندو پەردەمان دا بەسەر گوێیاندا کەهیچ نەبیسن.

(١٢) لەپاشان لەو خەوە زیندومان کردنەوە بۆ ئەوەی بەچاو ببینرێت‌و ئەو زانیاریەی ئێمە بۆ هەموان ئاشکرا ببێت کە کام لەو دوو حیزبە ماوەی مانەوەکەیان ئەزانێ تاهێزو گەورەیی ئێمەیان بۆ دەرکەوێت، ئەو دوو حیزبە مەبەست یارانی ئەشکەوت وخەڵکی شارەکەن کە مێژوی بەسەرهاتی ئەوانیان ئەزانی. جا خوا بەپێغەمبەرمان ئەفەرموێ:

(١٣) وا ئێمە داستانی ئەوان بەشێوەیەکی راست بۆ تۆ باس دەکەین ئەویش بەم شێوەیە: کە بێشك ئەوانە کۆمەڵە گەنجێك بوون کە باوەڕیان هێنا بو بە پەوەردگاری خۆیان، وەئێمەش زیاتر رێنمایی‌و رێ رۆشنیمان بۆکردن.

(١٤) جا ئێمە دڵی ئەوانمان بەهێز کردو ترسمان لەناو دڵیان دا لابرد ئەو کاتەی کە هەڵسان بە ئەرکی سەرشانی خۆیان‌و لێبڕاوانە بڕیاری خوا پەرستیان داو بەڕاشکاوی وتیان: بەراستی پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە کە ئاسمانان وزەوی دروستکردوەو ئێمە جگە لە ئەو هەرگیز بەندایەتی بۆ هیچ خوایەکی تر ناکەین ئەگەر ئێمە بەندایەتی بکەین بۆ جگە لە ئەو بەراستی ئەوە قسەیەکی درۆو زۆر نارێکمان کردوە، جا بەم شێوەیە دان بەیەکتایی (اللَّهُ) دا دەنێن هەم لە پەروەرندەییداو هەم لە ئیلاهو فەرمانڕەوایەتیدا، وە هەر ڕێگایەکی تر جگە لە یەکخواپەرستی بەناحەق‌و بێ بنەما دەزانن جا بۆیە وتیان:

(١٥) هائەم گەلەی ئێمە جگە لە خوا چەندین شتی تریان کردوە بەخوای خۆیان جا ئەگەر راست دەکەن با ئەوان بەڵگەیەکی ئاشکراو روون بهێنن لەسەر ئەو شتانەی کە ئەوان کردویانن بە خوای خۆیان، خۆ هیچ بەڵگەیەکیشیان نییە بەڵکو درۆ ئەکەن، جا کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە بە درۆ هاوەڵ بۆخوا دابنێت؟ جا ئەڵێن پاشای سەردەمیان هەڕەشەی لێ کردن بەڵام لەبەر ئەوەی گەنج بون نەیکوشتن وماوەی پێدان کەپەشیمان ببنەوە، ئەوسا ئەوانیش لەدەوری یەك کۆبونەوەو دەستیان کرد بە لێکۆڵینەوە لەو بارودۆخەی خۆیان‌و هاتنە سەر ئەوەی کە پەشیمان بونەوە لە ئارادا نییە، جا لەوە ئەچێ لە پێشدا بەو ئەشکەوتەیان زانی بێت، لەبەر ئەوە برای گەورەو دەم راستیان پێ وتن:

(١٦) جا کاتێك کە ئێوە بە بیرو باوەڕ لەئەوان‌و لەو شتانەیش کە جگە لە اللَّهُ دەیپەرەستن جیابونەتەوە دەی با بەلەشیش خۆتان جیابکەنەوە لە وان‌و بچن بۆ ئەشکەوتەکە، جا لە چۆنیەتی ژیان وخۆراك‌و ئەو شتانە مەترسن ئەگەر ئێوە ئاوا بۆ اللَّهُ لێبڕان‌و خۆتان بۆی یەك لاکردەوە پەوەردگارتان رەحمەتی

خۆی بۆ ئێوە فرەوان دەکاتو ئیشتان بۆ ئاسان دەکاتو نائومێدتان ناکات. بەڵێ بێگومان کاتێك کە باوەڕدار بۆ ﷲ لێبڕێتوتەنها پشت بەو ببەستێت ﷲ یش نائومێدی ناکاتو دەرگای خێرو خۆشی لێ دەکاتەوە هەر وەك لەم کۆمەڵە گەنجەی کردەوە، جا ئەو کۆمەڵە گەنجە چونە ئەشکەوتەکەو خەویان لێکەوت، وا ئێستا جێگاو چۆنیەتی خەوتنەکەیانمان بۆ باس ئەکات وئەفەرموێ:

(١٧) خۆ ئەگەر چاوت بەوان بکەوتایە دەتبینی کە ئەشکەوتەکە کاتێك کە رۆژ هەڵدەهات بەلای راستی ئەشکەوتەکەدا تێ دەپەڕی بێ ئەوەی لێیان بداتو زیانییان پێ بگەیەنێ وە هەر کاتێکیش کە ئاوا دەبو لەلای چەپیەوە کەمێك بە تیشکە خاوو فێنکەکەی ئەی گەستن تا لەشو جێگاکەیان لەو تیشکەی ئەو کاتەی رۆژ کەڵك وەرگرن، کەواتە دەرگای ئەشکەوتەکە روی لە باکوری رۆژئاوا کردوە ئەمە لەحاڵێکدا یە کە ئەوان لەبۆشاییەکی ئەم ئەشکەوتەدا بونو باران نەیدەگرتنەوە کە ئەوە بەشێکە لە نیشانەو ئایەتەکانیﷲ، هەرکەسێك کە ﷲ بەرەحمی خۆی رێنمای کات بێگومان هەر ئەوە بەختەوەرو رێنمایی کراوە، وە ئەوکەسەش کە ﷲ بە دادپەروەری خۆی گومڕاهی بکات هیچ دۆستو رێنمایی کارێکت بۆی دەست ناکەوێت. بێگومان گەیاندن بەرێگای راستو رەزامەندی پەروەردگار هەر بەدەست ﷲ یە، جا بۆیە هەر لەو زاتە داوای هیدایەتو رێنمای دەکرێت. پەروەردگار لەم ئایەتەدا ناوی وڵاتەکەیمان بۆ دیاری ناکات هەروەك چۆن لە دوایی دا ژمارەی ئەو گەنجانەمان بە راشکاوی بۆ باس ناکات تا تێمان بگەیەنێت زانینی شتانی ئاوەها سودو بەرژەوەندیەکی ئایینی تێدا نییە، ئەگەر تێیدابوایە بێشك کە باسی دەکرد بەڵام وەسفی ئەشکەوتەکەمان بە شتانێك بۆ باس دەکات کە ورد بونەوە لێیان کەڵکی زۆری تێدایە وەك ئەوە کە هەڵت دەنێت کە لە بارەی گەردوون ناسییەوە زانیاریت هەبێت یان ئەوەی کە بزانی زیانو خراپی راستەوخۆو بەردەوامی تیشکی رۆژ لە سەرلەشی مرۆڤ چیەو چ سودێکی هەیە بۆی ئەگەر بە ماوەیەکی کەم لە رۆژدا تیشکی رۆژ بەری بکەوێت بەتایبەت لەئێواراندا. بەڵێ پەروەردگار هەموشتی بۆ پاراستنی ئەوکۆمەڵە گەنجانە لەو ئەشکەوتەدا رەخساندبو.

(١٨) جا ئەوان بەشێوەیەك خەویان لێ کەوتبو ئەگەر تەماشای ئەوانت بکردایە وا گومانت ئەبرد کەئەوان بەخەبەرن لە حاڵێکدا کەئەوان خەوتبونو ئاگایان لەم ژیانە نەبو، وە ئێمە بۆ پاراستنی لەشو پۆشاکیان، لەشی ئەوان بەلای راست وچەپدا ئەم دیوو ئەو دیوو دەکەین، وە سەگەکەیشیان هەردوو قۆڵی راکێشابو لە لای

وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا ﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ﴿١٧﴾ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴿١٨﴾ وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٢٠﴾

دەرگای ئەشکەوتەداو بەهەست وبەلەش خەوتبو بەڵام بەچاو لە خەوتوی نەدەکرد، جا ئەگەر تۆ رێت بکەتایە لایانو ئەوانت بەو شێوەیە ببینایە هەر زۆر زوو پشتت تێ دەکردنو بەخێرای هەڵدەهاتیتودڵت پڕ ئەبو لە ترسی ئەوانو زاتت نەدەکرد کە لێیا نزیك ببیتەوە، واتە: ئەوانەی کە دوێنێ لە ترسی ستەمی خەڵك رایان دەکرد پەروەردگار وای لێکردن کە ئەمڕۆ خەڵك لەوان بترسێو رابکات، بەڵێ ئەو سەگەش لەبەرێزترین پەڕاودا ناوی مایەوە چونکە هاوڕێو پاسەوانی پیاوچاکان بو.

(١٩) جا چۆن خەواندنمانو گوێیان لەهیچ نەما هەر ئاوا لە پاش سێسەدو نۆ ساڵ زیندومان کردنەوە تا پرسیار لە یەکتری بکەنو بزانن چەندێکە لەو ئەشکەوتەدان، وێژەرێکیان وتی: چەندێك لێرە ماونەتەوە؟ گوتیان: رۆژێك یان تاقێك لێرەداین، هەندێکی تریان وتیان: نەخێر وانیە تەنها پەروەردگارتان ئەزانێت چەندێکە لێرەدان. وا دیارە شتانێکی دەوروبەریان وای لێکردون کە بکەونە گومانەوە لەو خەوەی خۆیان، جا ئەڵێ کاتێ هەستان هەستی برسێتیان کردو هاتنە سەر ئەوە کە یەکێکیان بەدزییەوە بنێرنە شارەوە بۆ ئەوەی خواردنیان بۆ بباب لەبەرئەوە وتیان: دەی بەم پارەیە یەکێکتان بنێرن بۆ شار، جا با ئەویش تەماشا بکاتو بزانێ لەو شارەدا کێ خۆراکێکی چاكو پاکی هەیە با بەشی پێبژێوییەك لەو خۆراکە بهێنێ بۆتانو با زۆر وردبینو لێزانبێتو بەشێوەیەك رەفتار بکات کە هیچ کەسێك هەستتان

وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوٓاْ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَآ إِذْ يَتَنَٰزَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ ۖ فَقَالُواْ ٱبْنُواْ عَلَيْهِم بُنْيَٰنًا ۖ رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٌ رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًۢا بِٱلْغَيْبِ ۖ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ۚ قُل رَّبِّيٓ أَعْلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ ۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَآءً ظَٰهِرًا وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّى فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُواْ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِاْئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُواْ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُواْ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ فِى حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾

پێ نەکات وپێتان نەزانن. بەڵێ باوەڕداری راستەقینە هەمیشە ئاگای لە خۆیەتیو پەروەردگاری لەبەرچاوەو هەوڵی ئەوە دەدات کە ئەو زاتە لە خۆی تورە نەکات ئەوەتە ئەو گەنجانە داوا لەو کەسەی کە دەینێرن بۆ بازاڕ دەکەن کەشتی پاکوحەڵاڵیان بۆ بکرێت، هەروەکو پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ:{ إِنَّهُ لَا يَرْبُو لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ إِلَّا كَانَتْ النَّارُ أَوْلَى بِهِ. /الترمذي، صححه الالبا / گومان لەوەدا نیە کەگۆشتی هەر لەشێك کە بە حەرام پەروەردە بوبێت ئەو لەشە هەر ئاگر شایستەیەتی} بەڵێ ئەوان بێئاگان لەوەی کە خەڵك لەوان دەترساو لەوان ڕای دەکردو ئەو زەمانەی کەئەوان تێیدا دەترسان دەمێکە بەسەرچوە، بۆیە بە یەکتریان دەوت،

﴿٢٠﴾ بێگومان ئەگەر ئەوان بزانن بەجێگاکەتان بەرد بارانتان دەکەن یان ناچارتان دەکەن کە پاشگەز ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆ سەر ئاینی ئەوان، وە ئیتر ئێوە هەرگیز نەلە دنیاداو نەلەدوا رۆژدا رزگار نابن. بەڵام ویستی پەروەردگار لەسەر ئەوە بو کە بەسەرهاتی ئەم کۆمەڵە گەنجە بۆ خەڵك ئاشکراکات تا بەڵگەیەك بێت بۆ زیادبونی باوەڕی باوەڕداران بە زیندو بونەوەو بیانو بڕێکیش بێت بۆ بێباوەڕان، جا پەروەدگار دەفەرموێ:

﴿٢١﴾ خۆ هەر وەکو خەبەرمان کردنەوە، هەروەهاش سەرپێی خەڵکمان لێ هەڵخلیسکاندن وئاشکرامان کردن جا خەڵك هاتنە لایانو چاویان کەوت پێیان تا خەڵك بزانێت بەڵێنی اللهُ راستەو هاتنی رۆژی قیامەتو زیندوبونەوە هیچ گومانی تێدا نییە، جا کاتێك کە بەسەرهاتو مێژوی سەرسوڕهێنەری ئەو تاقمە گەنجە بۆ هەمو خەڵك دەرکەوت، ئینجا هەر لەو شوێنەدا مردنەوە ئەوسا خەڵك لە بارەی چۆنیەتی رێز لێگرتنی ئەوانەوە لە نێوان خۆیاندا کەوتنە کێشەو مشتومڕەوە، جا هەندێکیان وتیان: با بینایەك لەسەر جێگەی ئەم پیاوانە بکەین و بەم شێوەیە وازایان لێبهێنین، پەروەردگاریان لە ئێوە زاناترە پێیان، بەڵام ئەوانەی کە خاوەن دەسەڵات بونو قسەیان جێبەجێ دەکرا وتیان: بەراستی ئێمە مزگەوتێکیان لەسەر دروست دەکەین. بەڵێ لە فەرمودەیش دا هاتوە کە گاورو جوەکان ئەمە ئیشیان بو هەر کات پێغەمبەر یان پیاو چاکێك لە ناویاندا بمردایە قەبرە کەیان دەکر بە مزگەوتو جێگای بەندایەتی، بەڵام پێغەمبەرمانﷺ باوەڕداران لەو کردەوە نارێکە کە گاورو جولەکە دەیان کرد بەرگری دەکاتو دەفەرموێ: {إِن مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ كَانُوا يَتخِذُونَ قُبورَ أَنْبِيَائِهِمْ وَصَالِحِيهِمْ مَسَاجِدَ أَلَا فَلَا تَتخِذُوا الْقُبورَ مَسَاجِدَ إِني أَنهَاكُمْ عَنْ ذَلِكَ. /مسلم/ ئەوانەی کە لە پێش ئێوەدابون گۆڕی پێغەمبەرانو پیاوچاکانیان دەکرد بە مزگەوتو جێی عیبادەت ئاگادار بن کە ئێوە گۆڕەکان نەکەن بە مزگەوت بێگومان کە من لەو کردارە بەرگریتان دەکەم}

پێغەمبەرمانﷺلە فەرمودەیەکی تردا نەفرینی لەگاورو جولەکە کردوە لە سەر ئەو کردارەو باوەڕدارانی لێ وریا کردوەتەوەو فەرمویەتی: {لَعْنَةُ ا ـِ عَلَى الْيَهُودِ وَالنصَارَى اتخَذُوا قُبورَ أَنْبِيَائِهِمْ مَسَاجِدَ يُحَذرُ مَا صَنَعُوا. /متفق عليه/ نەفرینی لەگاورو جولەکە کە قەبری پێغەمبەرانیان دەکرد بە مزگەوتو شوینی نوێژ کردن کردوە کە موسڵمانانیش لەوکارە دەترسێنێ}

جا لێرەدا ئەمە دەردەکەوێت کە کردنی گۆڕ بە مزگەوت لە ئایینەکانی پێشویشدا کردەوەیەکی قەدەغە کراو بوە ئەگینا پێغەمبەرﷺنەفرینی نەدەکردن کەوابو دروستکردنی مزگەوت لەسەر قەبرەکان کە رێگایەکە بۆ باز کردنی دەرگای شیرك لە هەمو ئایینەکاندا قەدەغە کراوە بەڵام بەداخەوە خەڵك لەپاش پێغەمبەران ئەو سونەتە ناڕەوایانەیان دەست پێکردوە وەك دەسەڵاتدارنی ئەم گەلەی یارانی ئەشکەوت، وە هەروەها پێغەمبەرﷺنوێژ خوێندن لە گۆڕستانو روبە گۆڕ نوێژ کردنو دانیشتن لەسەر گۆڕی قەدەغە کردوەو فەرمویەتی: {الْأَرْضُ كُلهَا مَسْجِدٌ إِلا الْحَمامَ وَالْمَقْبَرَةَ. /ابوداود، ابن ماجه، صححه الالبا / هەمو شوێنی زەوی جێگای نوێژ خوێندنە جگە لە حەمامو گۆڕستان}
وە لە فەرمودەیەکی تر دا هاتوە کە دەفەرموێ: {لَا تُصَلوا إِلَى الْقُبورِ وَلَا تَجلِسُوا عَلَيْهَا. /مسلم وغ ه/ روبە گۆڕەکان نوێژ مەکەنو لە سەریان دامەنیشن}

وە لە فەرمودەیەکی تریشدا هاتوە کە: {نَهَى النبي ﷺ أَنْ تُجَصصَ الْقُبورُ وَأَنْ يُكْتَبَ عَلَيْهَا وَأَنْ يُبْنَى عَلَيْهَا وَأَنْ تُوطَأ/الترمذي، صححه الالبا / پێغەمبەرﷺقەدەغەی کردوە کە قەبرەکان گەچ کاری بکرێن‌و لەسەریان بنوسرێت‌و خانویان لەسەر بکرێت‌و پێیان پێدا بنرێت}

بەڵێ ئیشی شەیتان ئاوا بەفێڵەو هەمو هەوڵی ئەوەیە کە بەندەکانی الله لەسەر رێی راست‌و میانەڕەوی لابدات، جا یان بەرەو توندڕەوی لەرادەبەدەریان ببات یان بەرەو کەمکاری‌و کۆتاهاتن لە ئایین رایان کێشێت، یارانی ئەشکەوت تازیندوبون دەسەڵاتدارانی سەردەم بە سەرلێشێواو گومرایان دادەنان‌و هەوڵی لەناوبردنیان دەدان، جا وا ئەمڕۆش لە رێزلێ گرتنیاندا زیادەڕەوی دەکەن‌و گۆڕەکانیان دەکەن بە جێگای نوێژو بەندایەتی کە هەردوو ئیشەکە دژایەتی‌و لادانە لەئایین. ئینجا پەروەردگار سەبارەت بە ژمارەی یارەکانی ئەشکەوت، ئەفەرموێ:

(٢٢) دەڵێن : سێ کەسبون وچوارەمیان سەگەکەیان، هەندێك دەڵێن: پێنج کەسبون‌و شەشەمیان سەگەکەیان بووە، ئەمانە هەر لەخۆیانەوە دەم لە غەیب دەکوتن‌و بە بێ بەڵگە لە خۆوە قسە دەکەن، وە هەندێکی تریان دەڵێن: حەوت کەس بوون‌و هەشتەمیان سەگەکەیانە، ئەی محمدﷺ بڵێ پەروەردگارم ئاگادارترە بەوەی کە ژمارەیان چەند بوە، خەڵك سەبارەت بە ئەوەی کە یارانی ئەشکەوت ژمارەیان چەند بووەو ئەو بەسەرهاتەیان لە کوێ‌و کەیدا بوە تەنها شتێکی کەمی لێ دەزانن، وەیان لەو بارەیەوە جگە لەکەسانێکی کەم زانیاریان نیە کەوابو لە بارەی ئەوانەوە کێشە مەکە جگە لە باسێکی رۆشن کە لەم قوروانەدا بۆت باسکراوەو تۆ لە بارەی ئەوانەوە داوای فتوا لە هیچ کەسێك مەکە چونکە هەرچی بڵێن گۆترەکارییەو دەمکوتانە لە غەیب. لەم ئایەتەدا پەروەردگار لەبارەی ژمارەی یارانی ئەشکەوتەوە باسی سێ بۆچونی کرد کە لۆمەی دوو لەو بۆچونانە دەکات‌و لەباری سێهەمیانەوە بێ دەنگ بوە، بۆیە هەندێ لە زانایان پێیان وایە ئەو بۆچونی سێهەمە راستە چونکە وەك دوو بۆچونی پێشو بەرپەرچ نەدراوەتەوە کەواتە پێیان وایە ژمارەی یارانی ئەشکەوت حەوت کەس بوە کە سەگە کەیشیان هەشتەمینیانە، والله اعلم. ئینجا پەروەردگار رو دەکاتە پێغەمبەر ﷺو ئامۆژگاری دەکات‌و دەفەرموێ:

(٢٣) هەرگیز مەڵێ بەدڵنیاییەوە کە من بەیانی ئەو ئیشە دەکەم.

(٢٤) مەگەر ئەوەی کە بڵێیت ئەگەر الله ویستی لەسەر بێت، واتە: بۆ ئەنجامدانی ئیشی ئاینده بڵێ: ئینشائەڵا. وە یادی پەوەردگاری خۆت بکە هەرکاتێك کە لە بیرت چویەوە، جا کەوابو ئەگەر وتت بەیانی فلان ئیش ئەکەم‌و ئینشائەڵات لەبیر نەبو هەرکاتێ کەوتە بیرت بڵێ: ئینشائەڵا، وە بڵێ: ئومێدی ئەوە دەکەم لە پەروەدگارم کە هیدایەتم بدات‌و رێنمایم بکات بۆ لەمە نزیکترو یارمەتیم بدات‌و رێم بخات لە قسەو باس‌و وبڕیارێکی راست ودروست تر، واتە: کاتێك پرسیارت لێ دەکەن روبکە دەرگای پەروەدگارت‌و لێی بپاڕێرەوەو داوای لێبکە کە رێنمونیت بکات بۆ ئەو رێگایەی کە نزیکترینە بۆ گەیشتن بە حەق‌و راستی. ئینجا خوا ئەفەرموێ:

(٢٥) جا یارانی ئەشکەوت ماوەی سێ سەد ساڵ لەو ئەشکەوتەدا مانەوەو خەڵکیش نۆ ساڵیان زیادکرد، واتە: بەحیسابی خۆری کە مێژوی سەردەمی ئەوان بو، ماوەی مانەوەیان سێ سەد ساڵ دەکات، بەڵام دواتر عەرەب حیسابی مێژوییان لە خۆری(**شەمسی**) گۆڕا بە گوێرەی مانگی ئاسمان، واتە: حیسابی (**قەمەری**) جا سێ سەد ساڵی خۆری دەکاتەوە سێ سەدو نۆ ساڵی مانگی. وە بەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت بەڵگەیەکە لەسەر راستی بۆچونی ئەهلی سوننەو جەماعە سەبارەت بەکەرامەتی پیاو چاکان، بەڵێ بەوشێوەیە پەروەردگار ماوەی مانەوەی یارانی ئەشکەوت بۆ پێغەمبەرمان ﷺ باس دەکات‌و پاشان فەرمانی پێدەدات کە،

(٢٦) ئەی محمدﷺبڵێ الله دەزانێت بەوەی کە ئەوان چەند لەو ئەشکەوتەدا بوون چونکە زانیاری نهێنیەکانی ئاسمانان وزەوی هەر بۆ ئەوە، چ عەجایب بینەرو بیسەرێکە ئەوە زاتە، جگە لەو زاتەش یارانی ئەشکەوت هیچ یارمەتی دەرێکیان بۆ نەبو، جا هەر ئەو زاتە بو کە بە سۆزو بە بەخششی خۆی ئەوانی پاراست، وە پەروەردگار لە بڕیارەکانی خۆیدا هیچ کەسێك ناکات بە هاوبەشی خۆی، واتە: الله لە بڕیارەکانیدا نە یارمەتی دەری هەیەو نەراوێژکار و نیازیشی بەکەس نیە، جا تۆش لە بڕیارو فەرمانڕەواییدا کەس نەکەی بە هاوبەش بۆ ئەو زاتە.

(٢٧) ئەوسا ئەی محمدﷺ دوای ئەوە بکەوە کە وەحی کراوەتە لات لە پەڕاوەکەی پەروەردگارتدا کە قورئانەو بیخوێنەرەوەو شارەزایی رێگای راستیان بکە کە بەراستی ئەو پەڕاوە بڕیارەکانی الله ی تێدایەو هیچ گۆڕێنەرێکیش نیە کە بتوانێ بڕیارو فەرمودەکانی الله بگۆڕێ‌و هیچ پەناگاو پاڵپشتێکت جگە لە ئەو زاتەش دەست ناکەوێت کەوابو هەر لە خۆی بترسەو هەر ئەو بکە بە پەناگاو پشتیوانی خۆت‌و نەترسی لە زۆری دوژمنان‌و ناحەزان، چونکە ئەوانە بەبێ ویستی الله ناتوانن هیچ شتێکت لە گەڵدا بکەن، جا کەوابو گوێ مەدە بە قسەی ئەوانەی کە ئەڵێن ئەم مرۆڤە کەم‌و نادیاریانە لە خۆت دور بخەرەوە ئەوسا ئێمە لێت نزیك ئەبینەوە.

وَٱصۡبِرۡ نَفۡسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ رَبَّهُم بِٱلۡغَدَوٰةِ وَٱلۡعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجۡهَهُۥۖ وَلَا تَعۡدُ عَيۡنَاكَ عَنۡهُمۡ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا تُطِعۡ مَنۡ أَغۡفَلۡنَا قَلۡبَهُۥ عَن ذِكۡرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمۡرُهُۥ فُرُطٗا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجۡرَ مَنۡ أَحۡسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهِمُ ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَيَلۡبَسُونَ ثِيَابًا خُضۡرٗا مِّن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۚ نِعۡمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتۡ مُرۡتَفَقٗا ﴿٣١﴾ ۞ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴿٣٤﴾

(٢٨) جا تۆ خۆت بگره لەسەر بڵاوكردنەوەی پەیامەكەتو لەگەڵ ئەو كەسانەدابە كە بەیانیانو ئێواران خەریكی بەندایەتی پەروەردگاری خۆیانن‌و تەنها مەبەستیان ڕەزامەندی ئەو زاتەیە كە دروستیكردون‌و ڕێنمای كردون جا بە مەبەستی دەستكەوتنی جوانی ژیانی دنیا چاویان لێ كلامەكەو بەكەمیان تەماشا مەكەو هەرگیز پەیڕەویش مەكە لەو كەسەی كەوا ئێمە دڵیمان بێ ئاگاو غافڵ كردوە لە یادی خۆمان‌و ئەویش دوای ئارەزۆكانی خۆی كەوتوەو ئەوەی بەرژەوەندی دنیاو دوارۆژی ئەوی تێدایە وازی لێهێناوەو بە ئیش‌و كرداری بێ كەڵكەوە سەرقاڵە، چونكە شوێنكەوتنی ئەمانە جگە لە پەشیمانی‌و بێ ئاگای بون لە یادی پەروەردگار بەرهەمێكی تری نیەو ئەركی تۆیش تەنها گەیاندنی ئەو پەیامەیە بە ڕاشكاوی.

(٢٩) جا بڵێ ئەمە حەق‌و ڕاستییەكە لەلایەن پەروەردگارتانەوە كەمن بە ئێوەم ڕاگەیاندوە جا كێ ئەیەوێت با باوەڕبهێنێت و هەركەسێكیش ئارەزۆی لێ نیە با كافر بێت ئەم ئارەزۆكارییەش بەو مانایە نیە كەهەركەس هەركامیان بكات لای پەروەردگار یەكسانە نەخێر بەڵكو ئەمە هەڕەشەیەكی توندی پەروەردگارە لە خەڵكی بێباوەڕ،واتە دەفەرموێ من پێغەمبەرو بەرنامەی حەق‌و ڕاستم بۆ ئێوە ناردوە جا ئەوەی كە نایەوێ بەختەوەر بێت با هەر كافر بێ لەڕاستیدا ئەوە ستەمی لەخۆی كردوەو ئێمەش ئاگرێكمان بۆ ستەمكاران ئامادە كردوە كە دیوارەكانی ئەو ئاگرە گەمارۆی داون‌و ئەوان لە ناوی دا دەرناچن، وە ئەگەر لە ناو ئەو ئاگرەدا داوای ئاو بكەن ئاوێكیان بۆ دەهێنرێت وەك مسی تواوە كە چەند گەرمە ئاوەهایە، جا كە هەر نزیكی دەم وچاویان كرایەوە دەم وچاوەكانیان دەبرژێنێت، دەی كاتێ كە دەیخۆنەوە ئەبێ چی لە ڕیخۆڵەكانیان بكات، ئەوەی كە دەی خۆنەوە خراپ ترین خواردنەوەیە كە ئێش‌و ئازاریان زیاتر دەكات، وە پیسترین جێگایشە جێگای ئارام گرتنیان كە ئاگری دۆزەخە كە ئارام گرتنێكی تێدا نیە. ئەمە ئەنجامی ئەو كەسانەیە كە بە ویستی خۆیان ڕێگای حەق‌و ڕاستیان نەگرتوەتە بەرو ستەمیان لەخۆیان كردوە، بەڵام ئەوانەی كەباوەڕیان هێناو دانیان بە ڕاستی ئەو پەیامە دا ناوەو بە كردەوەی چاكیش ئیمانەكەیان سەلماندوە پەروەردگار لەبارەیانەوە دەفەرموێ:

(٣٠) بەڕاستی ئەوانەی كەوا ئیمانیان هێناوەو كردەوەی چاكیان كردوە با ئەوانە دڵنیا بن كە بێگومان ئێمە پاداشتی ئەوكەسەی ئیشی چاكتر ئەكات نافەوتێنین.

(٣١) ئەوسا ئەوانە باغ وبێستانێكیان بۆ هەیە كە جێگەی دانیشتن‌و مانەوەی هەتا هەتاییە، لەژێر دەسەڵاتی ئەواندا چەندین ڕوبار دەڕوات‌و لەوێدا دەڕازێنرێنەوە وجوان دەكرێن بە دەستبەندانێكی زێڕین‌و دەپۆشێنرێن بە پۆشاكانێكی سەوز لەتەنك‌و لە قایمی ئاورێشمی، واتە: ئەوەی كە لە ژێرەوە دەیپۆشن ئاورێشمێكی تەنكەو ئەوەی سەرەوەیشیان ئاورێشمێكی قایم كە دانیشتون لەسەر تەختەكانیان بە ئاسودەییەوە شانیان دایەڵاوە، بەڕاستی ئەوە باشترین پاداشتەو باشترین جێگەی ئارامگرتن‌و حەسانەوەیە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {تَبْلُغُ الحِلْيَةُ مِنْ الْمُؤْمِنِ حَيْثُ يَبْلُغُ الْوَضُوءُ/مسلم وغ ە/ ئەو دەسبەندە زێڕو زیوەی كە باوەڕداران لە بەهەشتدا ئەیپۆشن دەگاتە ئەو جێگایانەی كە ئاوی دەست نوێژ پێی دەگات} وە ڕواڵەتی ئایەتەكە ئەوە دەردەخات پیاوان‌و ئافرەتانی بەهەشتی هەمویان لەو پاداشتی ڕازانەوەو جوانكاریەدا بەشدارن. ئینجا پەروەردگار دوو نمونە دەهێنێتەوە یەكێكیان دنیا پەرستەوئەوی تریان خوا پەرستە هەردووكیان ماڵ‌و سەروەتیان هەیە خوا پەرستەكە سەروەت‌و سامانەكەی لە ڕەزامەندی ﷲ دا بەكاری دەهێنێت وشتێكی زۆری بەدەستەوە نامێنێت بۆ ئەم ژیانە بەڵام ئەوی تریان لەڕێگەی پەرەپێدانی دنیادا بەكاری دەهێنێت، جا شێوەی ڕەفتارو سەرئەنجامی هەردووكیانمان بۆ باس دەكات‌و دەفەرموێ:

(٣٢) ئەی محمد ﷺ وێنەی ئەو دوو پیاوەیان بۆ باس بكە كە بە یەكێك لەوانە دوو باخی ترێمان داو چواردەوری ئەو دوو باخە

وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٣٨﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٤٢﴾ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلۡوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلۡحَقِّۚ هُوَ خَيۡرٞ ثَوَابٗا وَخَيۡرٌ عُقۡبٗا ﴿٤٤﴾ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ فَأَصۡبَحَ هَشِيمٗا تَذۡرُوهُ ٱلرِّيَٰحُۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقۡتَدِرًا ﴿٤٥﴾

ترێیەشمان بە باخی خورما گرت وەلە بەینی ئەم دوو باخەیشدا جێگەی زراعەتمان پێ داو،

﴿٣٣﴾ هەر یەك لەو دوو باخەش بەرێك وپێکی بەروبومی خۆیان ئەدا، وە لە بەروبوم دا هیچ کەم وکورِییەکی نەبو، وە لە ناو ئەو دووانەدا چەندین جۆگەو روبارمان بۆ دانا کە بە ناو ئەو دو باخەدا ئەرۆیشتن،

﴿٣٤﴾ جا ئەوکابرایە لەودوو باخەیدا بەرهەمی باشی دەست دەکەوت، جا لە حاڵێك دا کە لەگەل رەفیقەکەی کە پیاو چاك بو وتوێژی دەکرد، بە خۆ هەڵکێشانەوە پێی وت: من ماڵم لە تۆ زۆرترەو بەتواناترم لەتۆ چونکە کەس‌وکارو خزمەتکاری زۆرترم هەیە. وە بەم خۆ هەڵکێشانەشەوە نەوەستا بەڵکو،

﴿٣٥﴾ ئەو چوە ناو باخەکەیەوە لە حاڵێکدا بە هۆی بێ باوەڕی‌و ناسوپاسی‌و خۆبەزلزانیەوە ستەمی لەخۆی کرد بوو، وتی: پێم وانیە هەرگیز ئائەم باخ‌و بەروبومە بفەوتێت‌و لەبەین بچێت.

﴿٣٦﴾ جا پێیشم وانیە  کەقیامەت هەیەو بەرپا دەبێت، واتە: لە هاتنی قیامەتدا لەگوماندایە، جا بۆیە وتی: خۆ ئەگەر وەك تۆ دەڵێی قیامەتیش بێت‌و من ببرێمەوە بۆ لای پەروەردگارم لەوێش لەئێرە باشترم دەست دەکەوێت، چونکە پەروەردگار منی خۆش ویستوە کە لە دنیادا ئەم هەمو نیعمەتانەی پێداوم بە دڵنیاییەوە لە قیامەتیشدا هەر بەم شێوەیە بارودۆخی ژیانم چاکتر دەبێت.

﴿٣٧﴾ رەفیقەکەی لەحاڵێکدا کە قسەی لەگەڵا دەکرد پێ وت: ئایا نا سوپاس‌و بێ باوەڕی سەبارەت بەو زاتەی کە لە خاك دروستی کردویت‌و پاشان لە تۆماو لە ئەنجامدا بە تەواوی رێك‌و پێکی کردویت‌و تۆی کردوە بەم پیاوە؟

﴿٣٨﴾ بەڵام من وەك تۆ نیم بەڵکو باوەڕم وایە کە هەر زاتی (ﷲ)یە پەروەردگارمەو هەرگیز هیچ کەسێکیش ناکەم بە هاوبەشی پەروەردگارم.

﴿٣٩﴾ جا خۆزگە تۆش کە دەچویتە ناو باخچەکەتەوە بتوتایە: **ماشاء الله** ، ئەوەی کە (ﷲ) ئارەزۆی لێ یەتی هەر ئەو ئەبێ هیچ هێزێکیش نییە جگە لە هێزی (ﷲ) کە مرۆڤ بپارێزێت، جا دڵخۆش مەبە بەو سەروەت‌و سامانە دنیایی خۆت ئەگەر تۆ ئەبینی ئەمرۆ من لە تۆ کەمتر ماڵ‌و منداڵم هەیە.

﴿٤٠﴾ دەی من ئومێد دەکەم کە لە دوارۆژ دا پەروەردگارم باشتر لەو باخ‌و بێستانەی تۆم پێ بدات‌و بەنزیکیش دەبینم لە ئاسمانەوە بەڵایەك بۆ سەر باخچەکەی تۆ بنێرێت‌و لەناوی ببات، جا ئەو کاتە ئەو باخچە پڕ بەروبومە ببێیت بە زەویەکی سپی وساف‌و هیچ دارو درەخت‌و شینای بەسەرەوە نەمێنێت.

﴿٤١﴾ یان (ﷲ) ئاوەکەی بەناخی زەویدا ببات‌و وشکی کات، جا تۆ ئەو کاتە هەرگیز ناتوانی بچیت بە شوێن ئەو ئاوەداو دەری بهێنی، بەڵێ بەم شێوەیە ئامۆژگاری کردو پێی گەیاند ئەوەی کە سوپاسی نیعمەتەکانی پەروەردگاری نەکات‌و سپڵە بێت ئەبێ چاوەڕوانی سزای پەروەردگاریش بێت، جا چۆنیشی وت وا هاتەدی.

﴿٤٢﴾ ئەوسا هەمو باخ‌و بەرو بومەکەی بە سزای پەروەردگار گەمارۆ دراو هەموی لەناوچوو، جا لە داخ‌و حەسرەتا دەستی خۆی دەپوراندو ناڕەحەت بو لەسەر ئەو هەمو خەرجیەی کە لەو زەوی زارەی کرد بوی کەوا ئیستا تەنانەت درختەکانیشی کەوتون بەسەری یەکدا، جا ئەوکاتە پەشیمانی روی تێکردو وتی: خۆزگە من هەرگیز هاوبەشیم بۆ پەروەردگارم بڕیار نەدایە.

﴿٤٣﴾ ئەوکاتە کە ئاوا توشی سزای پەروەردگار بو جگە لە (ﷲ) هیچ کۆمەڵێك نەبو بۆی کە یارمەتیان بداو خۆیشی نەیتوانی تۆڵەی خوی وەرگرێت‌و سەرکەوێت‌و نەهێڵێت کە لە ناوچێت ئەو بەروبومە کە شانازی پێدەکردو پێی وابو کە لەناوچونی نیە.

﴿٤٤﴾ ئا لەوکاتەدا کە پەروەردگار بڕیاری سزا دەکات‌و بەڵاو عەزابی خۆی رەوانە دەکات بە راشکاوی بۆ هەموان دەردەکەوێت

ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾ وَيَوْمَ نُسَيِّرُ ٱلْجِبَالَ وَتَرَى ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴿٥١﴾ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾

که ئالەوێدا کەس هیچی لە دەست نایەتو دەسەڵاتداریەتیو فەرمانڕەوای ڕاستەقینە هەر بۆ (ﷲ)یە، هەرلای ئەو زاتەشە کە باشترین پاداشتو عاقیبەتی چاکتریش هەر لە لای ئەوە. وە ئەم چیرۆکە باشترین بەڵگەیە بۆ ئەوکەسانەی کە دنیا پەرستن تابزانن ئەگەر لە سەر و کوفرو ناسوپاسی خویان بڕۆن سەر ئەنجام پەنجەی پەشیمانی دەگەزن، وەلە داخو خەفەتدا دەستی خۆیان دەپروێنن، بەڵام ئەو کاتە هیچ سودێکی نابێ بۆیان، جا با پێش ئەوەی کەسزای پەروەردگار بدا بەسەریاندا بابیر بکەنەوە لەم داستانە کە پەروەردگاریان بۆ تەمێ کردنی ئەوانی ناردوە، سود وەربگرنو تەوبە بکەنو بەراستی ڕێگای پەروەردگاری خۆیان بگرن. جارێکی تر پەروەردگاری عالەم بۆ ئەوەی بەچاکی ژیانی ئەم دنیایە بناسین فەرمان بە پێغەمبەرمان ﷺ دەدات کە وێنەی ژیانی دنیامان بۆ باس بکات و دەفەرموێ:

﴿٤٥﴾ وێنەی ژیانی دنیایان بۆ بهێنەرەوەو بڵێ: ژیانی دنیا وەك ئەو ئاوە وایە کە ئێمە لە ئاسمانەوە ڕەوانەی دەکەین جا تێکەڵاو بە زەوی دەبێتو سەوزی دەکاتو بە گژوگیا دەیرازێنێتەوە، جا لەوکاتەدا کە جوانیو سەوزاوی زەوی سرنج ڕاکێش دەبێت ئەو سەوزاییە دەبێ بە پوشو وشكو ورد دەبێو بایش بەملاو بەولایدا دەبات، ئەوسا ئەو جوانیو سەوزاییە هیچ شوینەوارێکی نامێنێت، وە ﷲ بەسەر هەمو شتێکدا توانای هەیەو ویستی لە سەر هەرچی ببێت دەیکات. واتە: ژیانی دنیایش هەر ئاوەهایە کاتێك کە ئەو ژیانەی کە (ﷲ) داویەتی بەمرۆڤ بە جوانیەکانی دنیا وەك لەش ساغیو گەنجیو سەروەتو سامان دەڕازێتەوە خاوەنەکەی پێیدا دەنازێتو پێی وایە ئەو بارو دۆخەی هەرئاوەها دەمێنێتەوە بەڵام لەپڕدا مردن ڕێی پێدەگرێت ودەمرێتو زۆریش نابات لەشەکەیشی دەبێت بە خاكو خۆڵێك کە با بەملاو بەولای دا دەباتو لە جوانیەکانی ژیانی هیچی بۆ نامێنێتەوە .

﴿٤٦﴾ چونکە تەواوی سەروەتو ماڵ وکوڕان تەنها جوانیەکی ژیانی دونیایە بەڵام کردەوە چاکەکان کە دوادارەو دەمێننەوەو پاداشتی لە لایان پەروەردگارتەوە زۆر چاکترەوباشترین هیواو ئومێدە. وە هەر ئەو کردەوانەن شییاوی ئەوەن کەمرۆڤ دڵ خۆشبێت پێیان، بەشێك لەو چاکە دوادارانە ئەم وشە بەرزانەن {سبحان ا وا مد وا اک ولاالە الاا }.

واتە لە ژیانی دنیا هەر کردەوە چاکەکانن کە بۆ مرۆڤ دەمێنێتەوە، بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {الدُّنْيَا مَلْعُونَةٌ مَلْعُونٌ مَا فِيهَا إلا ذِكْرَ اللهِ وَمَا وَالاهُ أَوْ عَالِمًا أَوْ مُتَعَلمًا./ابن ماجه، الترمذي، حسنه الالبا / واتە:دنیاو ئەوەی کە تێیدایە نەفرین لێکراوە جگە لەیادی ﷲو ئەوەی کە ئەو زاتە پێی خۆشبێت وەیان جگە لەو کەسەی کە زانایە یان ئەوەی کە بە شوێنی زانست دا دەڕوات}

ئینجا ﷲ گەشتێکی ڕۆحیمان بەناو چۆنیەتی کاول بوونی دنیاو هاتنی قیامەتمان پێ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٤٧﴾ جا یادی ئەو ڕۆژە بکە کە ئێمە چیاکان لە شوێنی خۆیان هەڵ دەکەنینو پاڵیان پێوە دەنێینو وردیان دەکەین، جا وەك تۆزیان لێدێتو بڵاو دەبنەوەو نزماییەکانی زەوی پڕ دەکاتەوە ئەوسا زەوی ساف ئەبێت، جا ئەو کاتە زەوی ئەبێ بە دەشتێكو تۆ بە تەواوی دەیبینیت چونکە هیچ شتێك نیە بەرچاوت بگرێت، وە ئەو کاتە ئێمە هەمویان بە باوەڕدارو بێ باوەڕەوە لە هەر کوێدابن کۆ دەکەینەوە خۆ هیچ کامیشیان بەجێ ناهێڵین،

﴿٤٨﴾ ئەوسا هەمویان بەریز کراوی لە پێشگای پەروەردگارتدا پیشان دەدرێنو بۆ حیسابو کتاب ئامادە دەکرێنو کەسیش ناتوانێ خۆی بشارێتەوە، جا پەروەردگار دەفەرموێ: بەراستی ئێوە دێنەوە بۆ لای ئێمە هەر وەك چۆن لەسەرەتادا ئێوەمان دروستکردوە کە ڕووتو قوتو بێ دەسەڵات بوون هەر ئاوەهاش بەرووتو قووتیو بێ دەسەڵاتی دێن بۆلای ئێمە نەماڵو منداڵ، نەهۆزو نەگەل، ونەکۆڕو کۆمەڵ هیچ کام لەگەڵتاندا نیین، بەڵکو ئەی بێباوەڕان ئێوە گومانتان دەکرد کە ئێمە کاتمان دانەناوە بۆ

گەڕانەوەو لێکۆڵینەوەی کردەوەکانتانو باوەڕتان بەوە نەبوو؟! بەراستی ئێوە زیندو دەکرێنەوە،

﴿٤٩﴾ جا نامەی کردەوەکانتان بۆ دادەنرێت، جا ئەو کاتە دەبینی ستەمکاران لەوەی کە لە ناو ئەو نامەدا هەیە کە کوفرو تاوانەکانیانە زۆر دەترسن، چونکە دەبینن هەمو شت تۆمار کراوەو دەڵێن: هاوار بۆ ئێمە ئەم نامەیە نە بچووكو نە گەورەی نەبواردوەو هیچی بەجێی نەهێشتوەو هەموی تێدایەو ژمارەکراوەو ئەوەی کە کردویانە هەموی ئامادەیەو لە پێش چاویاندایەو دەیبینن، خۆ پەروەردگارت ستەم لەهیچ کەسێك ناکاتو زیادە لەسەر کەس نانوسێت بەڵکو ئەوەی کە لەو نامەدا هەیە کە ئەگەر بە زمان خۆیان شایەتی لەسەر نەدەن ئەندامەکانی تریان شایەتیان لەسەر دەدەن. ئینجا پەروەردگار دەچێتە سەر داستانی ئادەم سەلامی خوای لەسەر بێو ێپناسەیەکی کورتی ئەو شەیتانەمان بۆ دەکات کە ئاوا دوارۆژێکی پڕ مەترسی لەبیری زۆرێك لە رۆڵەکانی ئادەم بردوەتەوەو دەفەرموێ:

﴿٥٠﴾ جا بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە ئێمە گوتمان بە فریشتەکان سوجدە ببەن بۆ ئادەم ئەوسا ئەوانیش هەمویان سوجدەیان برد بۆ ئادەم جگە لە "ئیبلیس" کە شەیتانەو لە بەرەی جنۆکەکانە جا ئەو لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوو سوجدەی نەبردو بەر نەفرینی هەمیشەیی اللّٰه کەوت، دەی ئایا ئەوە ژیرانەیە کە ئێوە ئەو شەیتانەو نەوەکانی بکەن بە دۆستی خۆتان لە باتی من؟ لە حاڵێکدا ئەوان بۆ ئێوە دوژمننو ئەوەی کە زیانی ئێوەی تێدا بێت ئەوە دەکەن، جا هەر کەسێك ئەو ئاڵوگۆڕیە بکاتو لەباتی پەروەردگار، خۆی بەدەست شەیتانەوە بدات بەراستی ئەوە توشی ستەمێکی گەورە بووە، ئای چەند خراپەو چەند نابەجێیە بۆ ستەمکاران ئەو ئاڵوگۆڕەی کە دەیکەن. چونکە هەمو بەختەوەرییەك لە شوێنکەوتنی فەرمانەکانی اللّٰهدایەو هەمو چارەرەشیش لە شوێنکەوتنی شەیتانو دارو دەستەکەی دایە پاشان پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٥١﴾ من لە کاتی دروستکردنی ئاسمانانو زەویو بەدی هێنانی خۆیشیاندا ئەوانم ئامادە نەکردوەو گومڕاو سەرلێ شێواوانم نەکردوە بە راوێژکارو یارمەتی دەری خۆم، واتە: ئەوان خۆیان بەندەو دروستکراوی منن کە ئێوە دەیان پەرستنو دەیانکەن بە هاوبەشی من لە حاڵێکدا ئەوان هیچ زانیاریەکیان سەبارەت بە دروستکردنو چۆنێتیو چەندێتی ئاسمانانو زەویدا نیە تەنانەت لە کاتو ساتی دروستکردنی خۆیشیان بێ ئاگان، جا چۆن دەیان پەرستنو گوێڕایەڵیان دەکەن؟!

وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَا فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٖۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَكۡثَرَ شَيۡءٖ جَدَلٗا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤۡمِنُوٓاْ إِذۡ جَآءَهُمُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّهُمۡ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمۡ سُنَّةُ ٱلۡأَوَّلِينَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ قُبُلٗا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرۡسِلُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَۚ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّۖ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَمَآ أُنذِرُواْ هُزُوٗا ﴿٥٦﴾ وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعۡرَضَ عَنۡهَا وَنَسِيَ مَا قَدَّمَتۡ يَدَاهُۚ إِنَّا جَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۖ وَإِن تَدۡعُهُمۡ إِلَى ٱلۡهُدَىٰ فَلَن يَهۡتَدُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلۡغَفُورُ ذُو ٱلرَّحۡمَةِۖ لَوۡ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُواْ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلۡعَذَابَۚ بَل لَّهُم مَّوۡعِدٞ لَّن يَجِدُواْ مِن دُونِهِۦ مَوۡئِلٗا ﴿٥٨﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡقُرَىٰٓ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ لَمَّا ظَلَمُواْ وَجَعَلۡنَا لِمَهۡلِكِهِم مَّوۡعِدٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبۡرَحُ حَتَّىٰٓ أَبۡلُغَ مَجۡمَعَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ أَوۡ أَمۡضِيَ حُقُبٗا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجۡمَعَ بَيۡنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ سَرَبٗا ﴿٦١﴾

﴿٥٢﴾ ئەو رۆژەی کەاللّٰه دەفەرموێ: ئادەی بانگ بکەنە ئەو هاوبەش وشەریکانەی من کە لە دنیادا پێتان وابو شەریكو هاوکاری منن بەڵکو بێن بە دەمتانەوەو لەم سزایە رزگارتان بکەن، جا ئەوانیش بانگیان دەکەن بەڵام وەڵامیان نادەنەوە، وە ئێمە لە نێوانیاندا رێگرو بەربەستی دیواری ئاگرینمان داناوە هەرگیز فریای یەکتر ناکەون،

﴿٥٣﴾ جا ئەو کاتەی کە تاوانباران ئەو ئاگرە گەورەیان دی ئەوسا دەزانن کە بێگومان دەچنە ناویەوەو رێگای دەرچونیشیان نیەو هیچ شتێکیشیان دەست ناکەوێت کە لەو ئاگرە لایان بدات. ئەوەیە پاشە رۆژی خوانەناسانو ستەمکاران، ئینجا خوا ئەفەرموێ:

﴿٥٤﴾ بەراستی ئێمە لەم قورئانەدا چەندین وێنە ی جۆراوجۆر مان بۆ خەڵك هێناوە بۆ ئەوی بیر بکەنەوەو رێگای راستو دروست بگرنەبەرو واز لە کوفرو شیركو تاوان بهێنن، بەڵام مرۆڤ لەبەرامبەر ئەو هەمو وێنە رۆشنکەرەوانەدا بەراستی ئینسان لە هەمو شتەکانی تر مشتو مڕکەرو کێشە دروستکەرترە. لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی بوخاریو موسلیم ریوایەتیان کردوە هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ شەوێك لە دەرگای ماڵی فاتیمەی کچی دا کە خێزانی علی بو فەرموی: ئایا نوێژ ناکەن؟ عەلی ئەڵێ وتم: ئەی پێغەمبەر گیانمان بەدەستی خوایە، جا هەر

کاتێ ئارەزۆی لێ بێ خەبەرمان بکاتەوە، خەبەرمان دەکاتەوە، پێغەمبەرﷺگەڕایەوەو هیچی نەوت، لەپاشان گوێم لێ بو لەرانی خۆی ئەداو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:"بەراستی ئینسان زۆر مشتو مڕکەرە". بەڵێ زۆرن ئەوانەی کە لە بەرامبەر ئایەتەکانی پەروەردگارەوە دەمەقاڵەو مشتومڕ دەکەن، وە ئەوەی کە ئەوانی وا لێکردوە ئەوە نیە کە ئایەتەکانی پەروەرگار ڕۆنو ڕۆشنکەرەوەو خاوەنی بەڵگەی بەهێز نەبن، بەڵکو خۆبە زلزانینو دژایەتی باوەڕدارانە کە ئاوای لێکردون کە بێ باوەڕبنو لە بەرامبەر ئایەتەکانی ﷲ دا بوەستن، بەڵام کاتێ کە سزاو بەڵای پەروەدگاریان دی ئەوکاتە ئیتر مشتومڕێك لە ئارادا نامێنێتو بە چاکی باوەڕدەهێنن، جا بۆیە دەفەرموێ:

(٥٥) خۆ هیچ شتێك بەرگری نەکردوە لەوان کاتێك کە ڕێنماییان بۆ هاتوە کە باوەڕ بهێننو داوای لێخۆشبون لە پەروەردگای خۆیان بکەن جگە لەوەی کە ئەیانەوێ باوو نەریتی پێشوەکانیان بۆ دووبارە ببێتەوەو چی بەسەر ئەواندا هاتووە بە سەر ئەمانیشدا بێت یان سزایەکیان بۆ بێت کە بە چاوی خۆیان بیبینن؟!

(٥٦) ئەوسا ئێمە پێغەمبەرانمان ڕەوانە نەکردوە مەگەر بۆ ئەوەی کە مۆژدە بدەن بە چاکەکاران بە نازو نیعمەتێکی نەبڕاوەو خراپەکارانیش بترسێنن لە سزای زۆر توندی ﷲ، هەر ئەمەیە ئیشی ئەوان جا نەزۆر لە کەس ئەکەنو نەبۆ بەرژەوەندی دنیایی خۆیان بانگەوازی خەڵك دەکەن، وە بێ باوەڕان بە قسەی بێ ناوەرۆكو ناڕەوا کێشەو دەمەقاڵە دەکەن بۆ ئەوەی کە حەقو ڕاستی تێشکێننو لەبەینی ببەنو تا ئایەتەکانی ئێمەو هەڕەشەکانمان بەگاڵتە بگرنو سوکایەتیان پێ بکەن؟!

(٥٧) کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە بە نیشانەکانی پەروەردگاری خۆی ئامۆژگاری بکرێت بەڵام ئەو پشتی تێ بکاتو ئەو تاوانو خراپانەی کە لە پێشەوە کردویەتی لە بیری خۆی بباتەوە، جا مادام ئەوەندە ستەمکارە؟ بێگومان ئێمەش لەسەر دڵیاندا چەندین پەردەمان داناوە تا هیچ شتێك لەم قورئانە فام نەکەنو سودی لێ وەرنەگرن، وە لەناو گوێکانیاندا باری قورسمان داناوەو کەڕوکاسن لەبیستنی حەق وراستیدا، جا ئەی بانگ کەری ڕێگای ڕاست ئەوسا ئیتر ئەگەر تۆش بانگیان بکەی بۆ ڕێگای خۆشبەختیو هیدایەت ئەوان هەرگیز ڕێگای هیدایەتو ڕێنمایی ناگرن، چونکە ئەو لاساریەی خۆیان بوتە هۆی ئەودڵ ڕەقیو حەق نەبیستنەیان.

(٥٨) ئەوسا بە ڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر لێخۆشبوو خاوەنی سۆزو ڕەحمەتە، ئەگەر ئەو زاتە بە هۆی ئەو ئیشە خراپانەیانەوە زوو تۆڵەی لەوان وەرگرتایەو بەزەیی بەواندا نەهاتایەوە بەراستی خوا پەلەی دەکرد بۆیان وزوو سزای دەدان، بەڵام پەلە ناکات چونکە بۆ ئەوان کاتی دیاری هەیە، جا ئەو کاتە دیاری کراوەش کە هات جگە لە ﷲ هیچ سەنگەرو پەناگایەکیان دەست ناکەوێت.

(٥٩) ها ئەوە چەندین وڵاتە کە لە ناومان بردوون لەبەر ئەوەی ستەمیان کردوەو پەیڕەوی ئایینو پێغەمبەرەکانیان نەکرد جا بۆ هەر کام لەوانەش کاتی دیاری کراومان بۆ دانا بوو تا کاتە کەیان نەهات هەرچیان کرد کردیان بەڵام خۆ ئێستا ئێوە سەرەنجامی ئەوانە دەبیسنو دەبینن بۆ ئەبێ بیر نەکەنەوە؟ ئینجا خوای زاناو کار بەجێ بەسەرهاتێکی موسامان بۆ باس دەکات، ئەڵێن: موسا ڕۆژێك لە ناو بەنی ئیسرائیل دا وتارێکی کاریگەرو جوانی خوێندوە لە دوای وتارەکەی پیاوێك لێی پرسی ئەی موسا زاناترین کەس کێیە؟ ئەویش وتی: منم، جا شیاوتر ئەوە بووکە بیگوتایە: والله اعلم، هەر (ﷲ)یە زاناترو بە هەر کەسێکیش بیەوێت زانیاری پێدەدات، جا بۆیە پەروەردگار وەحی کردە لای کە بەندەیەك لە بەندەکانی من کە لە کۆجێی دوو بەحرەکەیە لە تۆ زاناترە، جا موسا وتی: ئەی پەروەردگارم چۆن بیدۆزمەوە، پێی فەرمو: ماسیەك بخەرە ناو زەنبیلەکەتەوە لە کوێ لێتان ونبوو ئەوە لەوێ دایە.

(٦٠) جا ئەی محمد باس بکە بۆ گەلەکەت ئەو کاتەی کە موسا بە لاوەکەی هاوڕێی کە یوشەعی کوڕی نون بو وتی: ڕێکەوە با بچین بۆ سەفەرێكو واز لە گەڕان ناهێنمو هەر دەڕۆم هەتا ئەگەمە ئەو شوێنەی کە هەردوو بەحرەکە بەیەك دەگەن ئەگەر چی ماوەیەکی زۆریشم پێ بچێت، جا کەوتنە ڕێگاو ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە دووانی دەریاکان.

(٦١) جا کاتێك کە گەیشتنە ئەو شوێنەی کە هەردوو دەریاکە بەیەك دەگەن لەوێدا ئەو ماسیەی کە پێیانبو زیندو بویەوەو خۆی فڕێدایە دەریاکە، جا ماسیەکە ڕێگەیەکی بۆ خۆی کردەوە لە ناو دەریاکەداو کونی کردو دەریاکە وەك شتێکی ڕەقی لێ هاتو ماسیەکە دیاربو، جا هەستانو چونو ماسیان لەبیر نەما!

(٦٢) جا کاتێك کە تێپەڕینو هەردووکیان لەو شوێنە دورکەوتنەوە ئینجا موسا بەو کوڕە گەنجەی کەلە گەڵیا بو وتی: خواردنەکەمان بۆ بهێنە با بیخۆین بەراستی لەم سەفەرەدا دوچاری نارەحەتی وماندوی بوین، خۆموسا تا گەیشتە شوێنی ئامانج ماندو نەبو بەڵام کاتێ لە ئامانج تێپەڕین هەستی بە ماندویەتی کرد.

﴿٦٣﴾ ئینجا لاوەکەش وتی: دەزانی کاتێ هاتینە لای بەردەکە ماسیەکە زیندو بویەوەو ڕۆیشتە ناو دەریاکە؟ بەراستی زۆرم پێ سەیرە کە ئەو شتە گرنگە ڕویدا کەچی من لە بیرم چو کە هەواڵەکەت پێ بدەم؛ هەر شەیتانبو کە لەبیری منی بردەوە کە بۆت باس بکەم، وە ئەو ماسیە ڕێگەی خۆی گرت لەو بەحرەداو بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ڕۆیشت بەناوی دا.

﴿٦٤﴾ موسا وتی: ئا ئەوەمان ئەوێ و مەبەستی ئێمە ئەو شوێنەیە جا هەردووکیان بە پەلە بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە.

﴿٦٥﴾ ئینجا لەوێ بەندەیەك لە بەندەکانی ئێمەیان دیت کە ئێمە سۆزێکی گەورەو گرنگمان پێدا بو لە لایەن خۆمانەوەو زانیاریەکی تایبەتیشمان پێدا بو.

﴿٦٦﴾ موسا پێ وت: ئایا ڕازی ئەبی کە من دوات بکەوم بۆ ئەوەی من فێر بکەیت لە بەشێك لەوەی کە بە چاکی و تەواوی شارەزاکراویت؟ بەڵێ زانیاری ئەوەندە گرنگە پێغەمبەرێکی خوایەو ﴿ أُوْلُواْ ٱلۡعَزۡمِ ﴾ ناڵێ ئەبێ لەگەڵ تۆدا بم، بەڵکو ئەڵێ دوات بکەوم بۆ ئەوەی شارەزام بکەیت، واتە: قوتابی هەر کەس هەبێ پێویستە ڕێزی مامۆستای بگرێت چونکە زانیاری کە نیعمەتێکی هەرە گەورەیە لەوەوە فێر دەبیت، بەداخەوە ئەمڕۆ حیزبایەتی قوتابیانیشی کردوە بەدژی مامۆستاکانیان؟!!

﴿٦٧﴾ ئەو کابرایەیش کە ئەڵێن:خدر بووە لەوەڵامی موسادا وتی: بێگومان تۆ لەگەڵ من دا خۆناگریت، چونکە ئەگەر لەگەڵ مندا بیت شتی وا دەبینیت کە بەرواڵەت ناڕەوایەوتۆناتوانی لێی بێدەنگ بیت،

﴿٦٨﴾خۆ تۆ کە پێغەمبەرێکی چۆن دەتوانی خۆت بگریت لەسەر ئیشێکی ئاوا کە ئاگات لە ناوەڕۆکی نیەو لێی ئاگادارنەبیت.

﴿٦٩﴾ موساش وتی: ئینشا ئەڵا تۆ دەبینی من خۆ دەگەرمو دژایەتی هیچ فەرمانێکی تۆ ناکەم،

﴿٧٠﴾ جا کابرا وتی: ئەگەر تۆ دوای من دەکەوی ئەوسا دەبێ پرسیاری هیچ شتێکم لێ نەکەیت هەتا خۆم باسی دەکەم بۆت،

﴿٧١﴾ جا لەسەر ئەم بڕیارو مەرجە هەردوو ڕۆیشتن هەتا سواری کەشتییەك بوون، کابرا کەشتییەکەی کون تێکردو تەختەیەکی لێ شکاند تەنها موساش دی، جا وتی: تۆ ئەو کەشتییە ئەشکێنی تا ئەوەی کە لە ناویدایە غەرق ببێ و بخنکێ؟ بەراستی تۆ شتێکی خراپ دەکەی؛

فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدۡ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبٗا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيۡتَ إِذۡ أَوَيۡنَآ إِلَى ٱلصَّخۡرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ ٱلۡحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيۡطَٰنُ أَنۡ أَذۡكُرَهُۥۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِي ٱلۡبَحۡرِ عَجَبٗا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبۡغِۚ فَٱرۡتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصٗا ﴿٦٤﴾ فَوَجَدَا عَبۡدٗا مِّنۡ عِبَادِنَآ ءَاتَيۡنَٰهُ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَعَلَّمۡنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلۡمٗا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلۡ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمۡتَ رُشۡدٗا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٦٧﴾ وَكَيۡفَ تَصۡبِرُ عَلَىٰ مَا لَمۡ تُحِطۡ بِهِۦ خُبۡرٗا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرٗا وَلَآ أَعۡصِي لَكَ أَمۡرٗا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعۡتَنِي فَلَا تَسۡـَٔلۡنِي عَن شَيۡءٍ حَتَّىٰٓ أُحۡدِثَ لَكَ مِنۡهُ ذِكۡرٗا ﴿٧٠﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَاۖ قَالَ أَخَرَقۡتَهَا لِتُغۡرِقَ أَهۡلَهَا لَقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـًٔا إِمۡرٗا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذۡنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرۡهِقۡنِي مِنۡ أَمۡرِي عُسۡرٗا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمٗا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلۡتَ نَفۡسٗا زَكِيَّةَۢ بِغَيۡرِ نَفۡسٖ لَّقَدۡ جِئۡتَ شَيۡـٔٗا نُّكۡرٗا ﴿٧٤﴾

﴿٧٢﴾ کابرا وتی: مەگەر من نەم وت کەتۆ لەگەڵ مندا توانای خۆ گرتنت نییە؟

﴿٧٣﴾ موسا وتی: ئەم جارە لێم مەگرەو سەر کۆنەم مەکە لەسەر شتێك کە لە بیرم چوەو لەم ئیشەمدا قورسی مەکە لەسەرم، کابرا بەهانەکەی موسای پەسەند کردو درێژەیان بەسەفەرەکەیاندا.

﴿٧٤﴾ ڕۆیشتن هەتا گەیشتن بە منداڵێك کابرا منداڵەکەی گرتو کوشتی، کە ئەمەی بینا ناڕەحەت بو وتی: ئایا نەفسێکی پاك بەبێ ئەوەی کەسێکی کوشتبێ دەیکوژیت؟ چۆن ئیشی وادەکەیت بەراستی ئیشێکی خراپت کرد؛

﴿٧٥﴾ جا کابرا توندتر وەڵامی دایەوەو وتی: ئەی من پێم نە وتیت کە تۆ توانای ئەوەت نیە کە لەگەڵ مندا خۆت بگری. لێرە وشەی ﴿ لَّكَ ﴾ی زیاد کردوە چونکە لەپێشەوە وتی: ﴿ قَالَ أَلَمۡ أَقُلۡ إِنَّكَ ﴾ جا موسایش زانی کە قسەکەی ڕاستەو بە جێیە، بۆیە.

﴿٧٦﴾ موسا وتی: ئەگەر لە پاش ئەم جارەی دووهەمە جارێکیتر لەبارەی هەرشتێکەوە پرسیارم لێ کردیت ئیتر تۆ هاوڕێیەتی من مەکە بەراستی لەلایەن منەوە بەهانەت بەدەستەو هیچ تاوانێکت نیە لە جیابونەوەدا، پاش ئەم قسەو گفتوگۆیە درێژەیان بەسەفەرەکەیان دا،

۞ قَالَ أَلَمۡ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسۡتَطِيعَ مَعِيَ صَبۡرٗا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلۡتُكَ عَن شَيۡءِۭ بَعۡدَهَا فَلَا تُصَٰحِبۡنِيۖ قَدۡ بَلَغۡتَ مِن لَّدُنِّي عُذۡرٗا ﴿٧٦﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهۡلَ قَرۡيَةٍ ٱسۡتَطۡعَمَآ أَهۡلَهَا فَأَبَوۡاْ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارٗا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥۖ قَالَ لَوۡ شِئۡتَ لَتَّخَذۡتَ عَلَيۡهِ أَجۡرٗا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيۡنِي وَبَيۡنِكَۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأۡوِيلِ مَا لَمۡ تَسۡتَطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ يَعۡمَلُونَ فِي ٱلۡبَحۡرِ فَأَرَدتُّ أَنۡ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٞ يَأۡخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصۡبٗا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلۡغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤۡمِنَيۡنِ فَخَشِينَآ أَن يُرۡهِقَهُمَا طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدۡنَآ أَن يُبۡدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيۡرٗا مِّنۡهُ زَكَوٰةٗ وَأَقۡرَبَ رُحۡمٗا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلۡجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيۡنِ يَتِيمَيۡنِ فِي ٱلۡمَدِينَةِ وَكَانَ تَحۡتَهُۥ كَنزٞ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحٗا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبۡلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسۡتَخۡرِجَا كَنزَهُمَا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ وَمَا فَعَلۡتُهُۥ عَنۡ أَمۡرِيۚ ذَٰلِكَ تَأۡوِيلُ مَا لَمۡ تَسۡطِع عَّلَيۡهِ صَبۡرٗا ﴿٨٢﴾ وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلۡقَرۡنَيۡنِۖ قُلۡ سَأَتۡلُواْ عَلَيۡكُم مِّنۡهُ ذِكۡرًا ﴿٨٣﴾

﴿٧٧﴾ جارۆیشتن هەتا گەیشتنە ناوخەڵكی گوندێك، داوای خواردن ومیواندارییان لێ كردن بەڵام ئەوان خواردنیان پێ نەدانو میوانداریان نەكردن بەو برسێتیەوە چاویان بەدیوارێك كەوت كە لاربوو خەریك بوو ئەكەوت، كابرا چوە لای دیوارەكەو هێمایەكی بۆ كردو راستی كردەوە، موسا بۆ جاری سێهەم رەخنەی لێگرتو وتی: تۆئەگەر بتویستایە لەسەر چاك كردنەوەی ئەم دیوارە كرێو مافی خۆتت وەردەگەرتو ئەماندا بەخواردنو لەو برسێتیە رزگار دەبوین بۆچی بە بەلاش بۆ ئەم گەلەی كە ئامادە نەبوون میواندارییمان بكەن راستت كردەوە ؟ ئینجا كابرا بۆ دواجارروی لەموساكرد،

﴿٧٨﴾ وتی: ئیتر ئا لێرەدا كاتی جیابونەوەی منو تۆیە، بە زوی مانای ئەو شتانەت پێ دەڵێم كە تۆ لە گەڵ مندا نەتتوانی لەسەریان خۆت بگری تا ئەو كاتەی كە خۆم بۆ تۆم باس دەكرد، جاوا كابرا كەم كەم مانای ئەو ئیشانەی خۆی بۆ موسا باس دەكاتو دەڵێ:

﴿٧٩﴾ ئەو كەشتییە هی چەند هەژارێك بوو كە لەو دەریایەدا ئیشیان پێ ئەكرد، من ویستم كە لەكەداری بكەم چونكە لە پێش دەمیاندا كە پێی دەگەیشتن پاشایەك بو كە هەر چی كەشتی بێ عەیبی چاو پێ بكەوتایە دەیگرتو بە زۆر دەی برد بۆ خۆی،

منیش ئاوا عەیبدارم كرد تا ئەو پاشا ستەمكارە نەیباتو بمێنێتەوە بۆ خاوەنە فەقیرەكانی.

﴿٨٠﴾ جا ئەو منداڵەش كەوا كوشتم باوك ودایكی باوەڕدار بوون ترساین كە ناچاریان بكاتو بەرەو سەركەشیو كوفر بیانبات، چونكە ئەو منداڵە سروشتی لە سەر كوفر دانرا بو، وەئەگەر بمایەوە باوكو دایكیشی توشی كوفر دەكرد، چونكە زۆریان خۆش دەویست. هەر وەك پێغەمبەرﷺدەفەرموێ:{ **إن الْغُلَامَ الَّذِي قَتَلَهُ الْخَضِرُ طُبِعَ كَافِرًا وَلَوْ عَاشَ لَأَرْهَقَ أَبَوَيْهِ طُغْيَانًا وَكُفْرًا.** /مسلم وغ ١٥/ واتە: بێگومان ئەو منداڵەی كە خدركوشتی مۆری كافری پێدا نرابو ئەگەر بمایە باوكو دایكی بەرەو سەركەشیو كوفر دەبرد }وەئەم فەرمودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئەو كابرایە خدر بوە. هەر خوایش زانایە.

﴿٨١﴾لەبەر ئەوە ئێمەش ویستمان پەروەردگاریان بیگۆڕێتەوە بۆیان بە كورێكی پاك ترو دڵسۆزتر.

﴿٨٢﴾ خۆ ئەو دیوارەش كە لاربو نزیكبوو بكەوێتو راستمان كردەوە بەبێ ئەوەی كە داوای هیچ پاداشت و ئەجرێك لە هیچ كەسێك بكەین هی دوو منداڵی هەتیوی شارەكە بو، وە لە ژێر ئەو دیوارەدا خەزێنەی ئەوانی تێدابو كە هی باوكیان بو، وە باوكی ئەوان پیاوێكی ساڵحوچاك بو لە بەر خاتری باوكیان ئەو چاكەیان لەگەڵ كرا، وە خوای تۆ ویستی كە ئەو دوو منداڵە پێ بگەنو بەهێز ببنو خەزێنەكەی خۆیان كە لەژێر ئەو دیوارە شاراوەتەوە دەری بهێنن جا ئەمە سۆزو رەحمەتێك بو لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ ئەو دوو منداڵە، وە ئەی موسا ئەو ئیشانەی كە من كردم هیچی لەسەر بیروڕای خۆم نەم كردووە بەڵكو فەرمانم پێكراوە، ئەوەیش بو مانای ئەو شتانەی كە تۆ تووانات نەبو خۆت بگری لەگەڵ مندا هەتا خۆم بۆت باس بكەم؟ پێغەمبەرﷺكە ئەم بە سەرهاتە باس دەكات دەفەرموێ: { **وَجَاءَ عُصْفُورٌ حَتى وَقَعَ عَلَى حَرْفِ السفِينَةِ ثُم نَقَرَ فِي الْبَحْرِ فَقَالَ لَهُ الْخَضِرُ مَا نَقَصَ عِلْمِي وَعِلْمُكَ مِنْ عِلْمِ اللهِ إلا مِثْلَ مَا نَقَصَ هَذَا الْعُصْفُورُ مِنْ الْبَحْرِ.** /متفق علیه/ واتە: مەلێكی بچوك هاتە سەر كەشتیەكە پاشان دونكی دا بەناو ئاوی دەریاكەدا، جا خدر بە موسای وت: زانستی من و زانستی تۆ شتێك لە زانیاریو عیلمی (ﷲ) كەم ناكاتەوە مەگەر ئەوندەی ئەوە نەبێت كە ئەو مەلە لە ئاوی ئەودەریایەی كەم كردەوە. دیارە خدر لە ژێر ویستو فەرمانی پەوەردگار ئەو ئیشانەی كرد بو، بەڵام كاتێك كە قسە دەكات وا وشەكان بەكار دەهێنێت كە بەرامبەر بە پەروەردگاری رێزو ئەدەبی تێدایە، بۆیە كاتێك باس لە عەیبدار كردنی كەشتییەكە دەكات، چونكە باس لە نارێكیو عەیب دەكات

دەیداتە لای ویستی خۆیو دەڵێت: ﴿ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا ﴾ وە کاتێك باس لە کوشتنی منداڵەکەو بەخشینی منداڵێکی تر لە باتی ئەودا دەکات بەشێکی بە لای ویستی خۆی دەداتو بەشێکی تری بەلای ویستی پەروەردگار دەدات جا بۆیە کۆی دەکاتەوەو دەڵێت: ﴿ فَأَرَدْنَآ ﴾ وە ئەو کاتەش کە باس لە لێبوردنو چاکە کردنو بەخشینی ماڵە بەو دوومناڵە هەتیوە دەیدات بەلای ویستی پەروەردگارداو دەڵێت: ﴿ فَأَرَادَ رَبُّكَ ﴾ جا موسایش لەم سەفەرەدا زانیاری زۆری لە خدرەوە دەست کەوتو بە چاکیش بۆی دەرکەوت کە لەو زاناتر هەیە، هەروەك لەسورتی یوسف دا فەرموی: ﴿ وَفَوْقَ كُلِّ ذِى عِلْمٍ عَلِيمٌ ﴿٧٦﴾ ﴾ واتە: لەسەر هەمو خاوەن زانیارییەکەوە زاناتر هەیەو لەسەر هەموانەوە(ﷲ)یە جل جلالە.

وە ئەمە کرداری دوو پێغەمبەری خودان کە وەحییان بۆ هاتوە هەروەك خدر دەڵێت: من بەندەیەکم کە فەرمان پێکراوەو هیچی بە بیروڕای خۆمم نەکردوە، جا ئەم کردارانەی خدر نابێ بکرێ بە بەڵگە لەسەر دوکاندارانی ئایین فرۆش کە بەناو کەرامەتەوە شتی پێچەوانەی ئایین ئەنجام بدەنو بڵێن پێمان وتراوە، کەرامات بۆ دۆستانی خوا راستە بەڵام نابێ ئەو ئیشە پێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بێ، خدر لێرە هەموی بەگوێرەی وەحی پەروەردگار ئەنجام داوەو ئیشەکەی شەریعەتی خودا بوە، موساش دژایەتی کردوە تا ئەو کاتەی راستیەکەی بۆ دەرکەوتوە ئیتر هیچی نەوتوە، وەك مەسئەلەی بڕیارەکەی داودو سلیمان لە بارەی زیانی حەیوانەکانەوە هەریەکەیان بڕیارێکیان هەبو لەو مەسئەلەداو خودا بڕیاری سلێمانی پەسەند کردو دەفەرموێ: ﴿ وَكُلًّا ءَاتَيْنَا حُكْمًا وَعِلْمًا ﴾ الأنبياء: ٧٩

واتە: ئێمە بە هەر دووکیان حوکم وعیلممان پێدابون﴿ فَفَهَّمْنَـٰهَا ﴾ بەڵام سولەیمانمان بەباشی لەو مەسئەلەیە تێگەیاند. واتە: هەردوو وەسف دەکات بە چاکی بڕیارو زانیاری، بەڵام بڕیاری سلێمان بە شیاوو چاکتر دادەنێت. ئێنجا خوای زاناو کاربەجێ داستانێکی ترمان بۆ باس ئەکاتو ئەفەرموێ:

﴿٨٣﴾ لە بارەی "زولقەرنەین"ەوە پرسیارت لێ دەکرێت بڵێ: وا من لەوبارەوە باسێکتان بۆ ئەخوێنمەوە کە پەندو ئامۆژگری بێت بۆتان.(ﷲ) ئەفەرموێ:

﴿٨٤﴾ ئێمە ئەومان لەم زەویدا سەقامگیر کردو پلەو پایەمان پێدا، وە هەر شتێك کە پێویستی ئەو بو لەو سەردەمەدا ئێمە هۆکانیمان پێدا بو، واتە: ئەی توانی هەرشتێکی پێویست بێ

إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ قَالَ ٱنفُخُوا۟ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَعَلَهُۥ نَارًا قَالَ ءَاتُونِىٓ أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا ٱسْطَـٰعُوٓا۟ أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا ٱسْتَطَـٰعُوا۟ لَهُۥ نَقْبًا ﴿٩٧﴾

بیکات چونکە هەم سەروەتو سامان هەم سەربازی بێ ژماریان هەبو،

﴿٨٥﴾ جا هەروەك هۆکانمان پێدا بو ئەویش بەجوانیو بە ڕێکو پێکی دوای هۆکارو سەبەبەکان دەکەوتو بە چاکی بەکاری دەهێنا جا بەرەو رۆژئاوا چوو وڵاتانی ئەوناوچانەی خستەژێر دەسەڵاتی خۆی،

﴿٨٦﴾تا گەیشتە ئەو جێگایەی خۆری تێیدا ئاوا دەبێت لەبەر چاوی وادیار بو کە خۆر ئاوادەبێو دەچێتە ناو چاوگەیەکی رەشی گەرمەوە واتە ئەوندە بەرەو رۆژئاوا رۆیشت تا ئیتر وشکای لەبەردەمی دا نەماو گەیشتە دەریاوخۆر لەبەرچاوی کەنزیك ئاوابونی بووای هەست کرد کە کەوتوەتەناو ئەودەریایەوە، جا لەوێ خەڵکێکی دی کە موشریك وبت پەرست بون، گوتمان: ئەی زولقەرنەین یان تۆڵەی خراپەو بت پەرستیەکانیان لێ وەرگرەو بیان کوژە یان بەشێوەیکی جوان رەفتاریان لەگەڵدا بکەو ئامۆژگاریان بکە. ﴿ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ / لەناوچاوگەیەکی گەرمدا﴾بەڵێ ئەگەر بەجوانی تەماشابکەیت ئەوکاتە کەخۆر نزیك ئاوابون دەڕوات لە ناو دەریاداو پرشنگی خۆرەکە لەدەریادەدات وەکو هەڵمی ئاوی گەرمولێڵوکاتی ونبونی رەش بەرچاوی بینەر دەکەوێت، جاکاتی ئاوابونی وادەر دەکەوێت

قَالَ هَٰذَا رَحۡمَةٞ مِّن رَّبِّيۖ فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ رَبِّي جَعَلَهُۥ دَكَّآءَۖ وَكَانَ وَعۡدُ رَبِّي حَقّٗا ﴿٩٨﴾ ۞ وَتَرَكۡنَا بَعۡضَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ يَمُوجُ فِي بَعۡضٖۖ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَجَمَعۡنَٰهُمۡ جَمۡعٗا ﴿٩٩﴾ وَعَرَضۡنَا جَهَنَّمَ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡكَٰفِرِينَ عَرۡضًا ﴿١٠٠﴾ ٱلَّذِينَ كَانَتۡ أَعۡيُنُهُمۡ فِي غِطَآءٍ عَن ذِكۡرِي وَكَانُواْ لَا يَسۡتَطِيعُونَ سَمۡعًا ﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَن يَتَّخِذُواْ عِبَادِي مِن دُونِيٓ أَوۡلِيَآءَۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا جَهَنَّمَ لِلۡكَٰفِرِينَ نُزُلٗا ﴿١٠٢﴾ قُلۡ هَلۡ نُنَبِّئُكُم بِٱلۡأَخۡسَرِينَ أَعۡمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعۡيُهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا ﴿١٠٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنٗا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمۡ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُواْ وَٱتَّخَذُوٓاْ ءَايَٰتِي وَرُسُلِي هُزُوًا ﴿١٠٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتۡ لَهُمۡ جَنَّٰتُ ٱلۡفِرۡدَوۡسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبۡغُونَ عَنۡهَا حِوَلٗا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوۡ كَانَ ٱلۡبَحۡرُ مِدَادٗا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّي لَنَفِدَ ٱلۡبَحۡرُ قَبۡلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّي وَلَوۡ جِئۡنَا بِمِثۡلِهِۦ مَدَدٗا ﴿١٠٩﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ﴿١١٠﴾

کەبەناو ئەوئاوەگەرمولێڵو رەشە دا چووەتە خوارەوە، سبحان الله چەند جوانە ئەوتەعبیرە قورئانیە.

﴿٨٧﴾ جا زولقەرنەین وەڵامی دایەوەو وتی: ئەوانەی کەهاوبەش وشیرك بۆ خوا دابنێن بەم زوانە دەی کوژین لە پاشان دەگەڕێنرێتەوە بۆلای پەروەردگاری خۆی ئەوسا لەوێ سزای ئەدات بەسزادانێکی سەختو ناشیرینو بێزراو چونکە خراپکێڵو بت پەرست بوە.

﴿٨٨﴾ وە ئەوەیش کە باوەڕی هێناوەو کردەوەی چاکی کردوە بۆ ئەو هەیە پاداشتێکی چاکتر لە ئیشەکانی خۆی کە بەهەشتە، وە لەمەولا ئێمەش فەرمانەکانی خۆمانی بۆئاسان دەکەین لە دنیادا، خواش ئیشەکانی بۆ ئاسان ئەکاتو خۆشەویستی ئەخاتە ناو دڵیەوەو ماندو بون نازانێ‌و لەرۆژی قیامەتیشدا هەرچی داوابکات خوا بۆی ئاسان ئەکاتو ئەیخاتە دەستیەوە، ئینجا زولقەرنەین ویستی بەرەو رۆژهەڵات بڕوات.

﴿٨٩﴾ لە پاشان هۆکانی سەفەری بەکار هێناو رۆیشت.

﴿٩٠﴾ تا گەیشتە ئەو شوێنەی کە رۆژی لێ هەڵ ئەهات لە وێش تەماشای کرد خۆر لەسەر گەلێك هەڵدێت کە ئەو گە لە جگە لەو خۆرە هیچی تریان نییە کە خۆیانی پێ داپۆشن‌وروت‌وقوتن،

﴿٩١﴾ هەر چۆنێ کە هێزو ئەسبابمان پێدابو هەر ئاوەهاش ئێمە بە تەواوی ئاگامان بو لە هەمو ئەو شتانەی کەلەلای زولقەرنەیندا بون.

﴿٩٢﴾ پاش ئەمەش دیسان هۆکانی کاروان‌و سەفەری بەکار هێنا بۆرۆیشتن،

﴿٩٣﴾ جا رۆیشت هەتا گەیشتە نێوان دوو چیا، لە نزیکی ئەو دوو چیایەدا گەلێکی دی کە نزیك بو لەهیچ قسەیەك تێ نەگەن ئەوان هاتنە لای زولقەرنەین‌و پەروەردگار هۆکارەکانی وا بۆ رەخساند بو کە بتوانێت لێیان تێ‌بگات، جا ئەوانیش کاتێ کە هێزو دەسەڵاتی زولقەرنەینیان دی شکاتی بارودۆخی نالەباری ئەوناوچەی خۆیان بردە لای،

﴿٩٤﴾ وتیان: ئەی زولقەرنەین بەراستی یاجوج وماجوج کە دوو تیرەبون هەر خەریکی خراپەو خراپە کارین‌و بوون بە هۆی ئاژاوەو دەردەسەری بۆمان لەم ناوچەیەدا ئایا بە پارەو ماڵ یارمەتیت نەدەین بۆ ئەوەی کە لە نێوان ئێمەو ئەواندا بەربەستێك دروست بکەیت؟ بۆ ئەوەی ئیتر ئەوان نەتوانن بێنە ئەم ناوچەیەو ئێمەش لە شەڕیان رزگار ببین؟ زولقەرنەین کاتێك دی داواکارییەکەیان بەجێیە خۆی بە بەرپرس زانی کە رێگە لەو خراپەکارانە بگرێ.

﴿٩٥﴾ وتی: من پێویستم بە پارەو ماڵی ئێوە نییە، چونکە ئەوەی کە پەروەردگارم بە منی داوەو خستویەتیە ژێر دەستمەوە زۆر چاکترو زۆرترە لەوەی کە ئێوە دەتانەوێ یارمەتی منی پێ‌بدەن بەڵام خۆتان بە کارو ئیشکردن یارمەتیم بدەن من لە نێوان ئێوەو ئەواندا بەربەستێك دروست دەکەم، دیارە ئەوانیش بەو بڕیارەی زولقەرنەین رازی بون.

﴿٩٦﴾ جا زولقەرنەین وتی ئادەی پارچەگەلی ئاسنم بۆ بهێنن ئەوانیش لە هەمو لایەکەوە پارچە ئاسنیان بۆ هێنا وەك خشت لەسەر یەکیان دانا هەتا بەرز بوویەوەو یەکسان بو لەگەڵ هەردوو چیاکاندا، جا دەڵێن خەڵوز (رەژو)ی دانا لەنێوان ئاسنەکانداو پاشان وتی: ئادەی بیدەمێنن، ئەوانیش دەماندیان‌و هەمو رژوەکە بو بەپشکۆو ئاسنەکان سور بوونەوە تا وای لێ هات وەك یەك ئاگری گەورە، جا لەو کاتەدا وتی: مزی تواوەو قوڕقوشمم بۆ بهێنن تا بیرژێنم بەسەری ئەو پارچە ئاسنانەی کە نزیکە ئەوانیش بتوێنەوە جا ئەوانیش بۆیان هێناو ئەویش کردی بەسەریداو بو بەیەك پارچە ئاسنی بەهێزو بەرزو ساف.

﴿٩٧﴾ کە ئیتر ئەوان نەیانتوانی سەرکەون بەسەر ئەو بەربەستەداو نەیشیان توانی کونی بکەن‌و ئەو گەلەیش کە

یارمەتی زولقەرنەینیان دا رزگاربون لە شەڕیان، جا لێرەدا زولقەرنەین لە خۆی بای نەبو، وە خۆی هەڵنەکێشا بەسەر ئەو خەڵکە فەقیرەدا بەڵکو سوپاسی خوای کرد.

﴿٩٨﴾ وتی: ئا ئەمە سۆزو رەحمەتێکە لەلایەن پەروەردگارمەوە کە لەگەڵ ئێوەیداکرد تا لە شەڕی ئەو خراپەکارانە رزگارببن، وە ئەوەش بزانن کە ئەم بەربەستە کاتیەو جا هەر کاتێ بەڵێنی پەروەردگارم هات خوا ئەو بەربەستە لەناو دەباتو لەگەڵ زەویدا رێکی دەکات، وە بەراستی بەڵێنی خوای من حەقەو دێتە دیو رۆژێك لە رۆژان ئەو بەربەستو سەدە نامێنێت.

زەینەبی کچی جەحش کە خێزانی پێغەمبەرە ﷺ وتی: جارێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ماڵەوە لەحاڵێکدا ترس بەسەرو سیمایدا دیار بو، جا لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: { لَا إِلَهَ إِلَّا اللهُ وَيْلٌ لِلْعَرَبِ مِنْ شَرٍ قَدْ اقْتَرَبَ فُتِحَ الْيَوْمَ مِنْ رَدْمِ يَأْجُوجَ وَمأْجُوجَ مِثْلُ هَذَا وَحَلقَ بِإِصْبَعِهِ السَبَابَة وَبِالتِي تَلِيهَا فَقَالَتْ زَيْنَبُ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ أَنَهْلِكُ وَفِينَا الصالِحُونَ قَالَ نَعَمْ إِذَا كَثُرَ الْخَبَثُ. /متفق علیه/ لا اله الا ا ، وای بۆ عەرەب لەو خراپەو کارەساتە گەورەیەی کە نزیك بووەتەوە، ئەمرۆ لە بەربەستەکەی یاجوجو ماجوج بەم ئەنازەیە کراوەتەوە بە پەنجە بەرانەو پەنجەی شەهادەی حەڵقەیەکی دروستکرد. زەینەب دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەر ﷺ ئایا دەگونجێ لە ناوبچین لە حاڵێکدا پیاو چاکانمان تێدایە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ، کاتێك زینا زۆر بو دەگونجێ چاكو حراپ تێدا بچێت}.

بەڵێ زولقەرنەین ئەو بەربەستەی دروستکردو یاجوج ماجووجیش لەو دیوی بەربەستەکەمانەوە، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿٩٩﴾ جا ئێمە بڕیاری مانەوەی ئەوانماندا کە لەو دیوی بەربەستەکەوە بۆخۆیان وەك شەپۆلی دەریا بەناویەکدا بێنو برۆنو تەنها زیانیان بۆ خۆیان ببێت هەتا کاتی دیاری کراویان، جا کاتێك کە ئەو بەربەستە لەناو دەچێت بەسەر ئەم زەوییەدا بڵاو دەبنەوە کە ئەوەش کاتی نزیك بوونەوەی قیامەتە. وە فوو دەکرێت بە سوردا، جا ئەو کاتە ئێمە هەمویان کۆ دەکەینەوە بۆ لێکۆڵینەوەو پاداشت و سزاو کەسیش لەم زیندو کردنەوەو ئامادە کردنەدا جیا ناکرێتەوە، چاكو خراپ گەورەو بچوك پیاو ئافرەت مرۆڤ وجنۆکە هەمویان لەمەیدانی مەحشەردا کۆدەکرێنەوە.

﴿١٠٠﴾ جا لەو رۆژەدا ئێمە دۆزەخ پیشانی کافران دەدەین کە بە چاوی خۆیان ببینن.

﴿١٠١﴾ ئەوانەی کە لە ئاستی یادی مندا چاویان لە پەردەدا بو ئەو هەمو بەڵگەو شوێنەوارانەی کە تەنهاییو دەسەڵاتی منی دەسەلماند نەیاندەبینی و نەیان دەتوانی کەحەقو راستی ببیسن.

پاشان پەروەردگار دەمکوتی ئەو کافرانە دەکات کە پێیان وایە کە ئەگەر پێغەمبەرانێکی وەکو عیساو عوزەیرو پیاوچاکانی تریان خۆش بویەتو لە جیاتی پەروەردگار بەنداتەتیان بۆ بکەن ئیتر ئەوە بەسە بۆیانو لە دوارۆژیشدا لە ئاگری دۆزەخ رزگاریان دەکەن دەفەرموێ:

﴿١٠٢﴾ ئایا ئەوانەی کەوا کافرن واگومان دەکەن کە ئەگەر لە باتی من دا بەندەکانم بکەن بە دۆست بۆ خۆیان ئیشێکی باشیان کردووە ئێمە سزایان نادەین؟ نەخێر وا نییە بەراستی ئێمە دۆزەخمان بۆ کافران ئامادە کردوە بۆ شوێنی میوانداریو پێش وازی لێ کردنیان.

﴿١٠٣﴾ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئایا خەبەرتان بدەینێ کە کێیە کە لە ئیشەکانی دا لە هەمو کەس زیاتر زیانی کردوە؟

﴿١٠٤﴾ ئەو کەسانەن کە کارو کۆششیان لە ژیانی دونیادا بە شێوەیەکی ناڕەواو دژی شەریعەتی (ﷲ) بووەو خۆیان واگومان دەکەن کە بێگومان هەر ئەوانن کە کردەوی جوانو چاك دەکەن کە مایەی رەزامەندی خواو خەڵکەو لە پاشەرۆژیشدا کەڵکی لێوەردەگرن. جا ئەمانە رنجەڕۆ ترین کەسن چونکە لە دنیادا خۆیان خەریك دەکەن بەو کردارانەوە کە پێیان وایە چاکەو لە دوارۆژیشدا پاداشتیان لەسەر وەردەگرنەوە بەڵام لە دوارۆژدا ئەو کردارانەیان لێ وەرناگیرێتو بەرەو ئاگری دۆزەخ دەبرێن ، واتە: ئەوانە رەنجەڕۆترین کەسن لە دوارۆژدا. جا کێن ئەوانەی کە ئاوا رەنجەڕۆن؟

﴿١٠٥﴾ئەوانە کەسانێکن کە بێباوەڕبون بەئایەتەکانی پەروەردگاری خۆیانو باوەڕیان بەگەیشتنو دیداری ئەو زاتە نەبو، جا پەروەردگارش بەهۆی ئەو بێباوەڕیەوە کردەوە چاکەکانیانی لێ هەڵوەشاندونەتەوە، جا لەرۆژی قیامەتیشدا هیچ نرخێکیان بۆ دانانرێت وەهیچ حسابێکیان بۆ ناکرێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (إِنَهُ لَيَأْتِي الرجُلُ الْعَظِيمُ السمِينُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يَزِنُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ وَقَالَ :اقْرَءُوا ﴿ فَلَا نُقِيمُ لَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَزۡنًا ﴾ /متفق علیه/ بەراستی پیاوی گەورەی قەڵەوی وادێت لە رۆژی قیامەتا کە لە لای ﷲ بەئەندازەی باڵی مێشولەیەك نرخی نییە، وە فەرموی: ئەگەر ئارەزۆتان لێیە با ئەم ئایەتە بخوێننەوەو وەسەیری ماناکەی بکەن (لە رۆژی قیامەتا هیچ نرخێکیان بۆ دانانێین).

جا سەرەرای ئەوە کە کردەوەکانیان کە خۆیان بە چاکیان دەزانی لێیان وەرناگیرێت ، بەڵکو پاداشتیان پێدەدرێتەوە بەڵام چ پاداشتێك؟

(١٠٦) بەهۆی ئەوە كە كافر بوون‌و گاڵتەیان بە ئایەتەكانی من وپێغەمبەركانی من كردوە لە دنیادا، پاداشتی ئەوان دۆزەخە. جا گاڵتەكردن‌و بێباوەڕی هەرئەوەنیە كە بەدەم بوترێت بەڵكو بابەدەمیش هاواری خۆشەویستی خواو ئایین بكات‌و خۆی بە مسڵمان دابنێ بەڵام كاتێك بەكردارو هەڵس وكەوت دژی خواو ئایین بو كافر دەبێ‌و بەگاڵتەكەر بەنیشانەكانی خواو پێغەمبەرەكەیﷺ دادەنرێت لەلایەن خواوە، ئەوەبو مونافقەكان دەیان وت ﴿ نَشْهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِ ﴾ شایەتی ئەدەین كە بێشك تۆ پێغەمبەری خوایت، خوایش فەرموی ﴿ وَٱللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴾ **المنافقون: ١** خوا شایەتی دەدات كە ئەو منافقانە درۆدەكەن، جا لەپاشاندا دەفەرموێ:

(١٠٧) بەراستی ئەوانەی كە ئیمانیان هێناوەو كرداری چاكیان كردوە باخچەكانی فیردەوس كە بەرزترین شوێنی بەهەشتە جێگەی میوانداری ئەوان دەبێ‌و لەو جێگەدا پشوو دەدەن‌و پێشوازی‌و میوانداریان لێ دەكرێت.

(١٠٨) بۆ هەمیشەیش لەوێدا دەمێننەوەو ئەوەندە لایان خۆش‌و دلگیرە هەرگیز نایانەوێ لەوشوێنەدا دەربچن‌و بەرەو لایەكی تر برۆن‌و بارودۆخیان بگۆڕن. ئەمە شێوەی میوانداری لێ كردنی باوەڕدارانی راستە، وە لە پێشیشەوە جێگای میوانداری بێباوەڕانت زانی، دەی مرۆڤی ژیرو دوربین دەبێ كامیان هەڵبژێری؟ ئاگری سوتێنەری دۆزەخ یان باخچەكانی فیردەوس كە پێغەمبەرﷺلە وەسفی دا دەفەرموێ:{ فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللهَ فَاسْأَلُوهُ الفِرْدَوْسَ فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الجَنةِ وَأَعْلَى الجَنةِ أُرَاهُ فَوْقَهُ عَرْشُ الرحْمَنِ وَمِنْهُ تَفَجرُ أَنْهَارُ الجَنةِ./البخاري/ واتە: هەر كاتێ داوای بەهەشتتان كرد لە (ﷲ) داوای فیردەوس بكەن چونكە بێگومان ئەوە چاكترین جێگای بەهەشتەو بەرزترین شوێنێتی‌و وام پیشاندراوە كە عەرشی رەحمان لەسەر ئەوەیەو لەوێوە روبارەكانی ناو بەهەشت دێن}.

ئینجا ﷲ باسی زۆری وفرەوانی فەرمودەكانی خۆی دەكات‌و ودەفەرموێ:

(١٠٩) ئەی محمدﷺپێیان بڵێ: ئەگەر ئەم دەریایە هەموی مورەكەب بێت بۆ نوسینی وشەكانی پەروەردگارم دەریا هەموی دوای دێت پێش ئەوەی كەوشەكانی پەروەردگام دوای بێت، ئەگەر چی بەئەندازەی ئەو دەریایەش دیسان دەریای تر مورەكەب بهێنین بۆ نوسینی وشەكانی پەروەردگار ئەویش دوای دێت هێشتا هەروشەكانی پەروەردگار دەمێنێ، بەڵی ئەمە بۆ تێگەیاندنی ئێمەیە ئەگینا دەریاكان دورستكراوێكن وەك هەمو دروستكراوەكانی ترو تەواو بونیان هەیە، بەڵام فەرمانەكانی پەروەردگار هەروەك وەسفەكانی تری بێ بڕاوەو بێ‌وێنەن. پاشان ﷲ فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەكەی كە،

(١١٠) ئەی محمدﷺ پێان بڵێ : بێگومان من هەر مرۆڤێكم وەك ئێوە كە وەحی دەكرێتە لام كە خوای ئێوە خوایەكی تەنهایەو هاوبەشی نیە. خۆ نەدەم لە خوایەتی دەكوتم نە فریشتەم نە غەیب دەزانم جا ئەگەر پێغەمبەر نیم دەیچۆن ئەو شتانە دەزانم؟ جا ئەوكەسەی كە ئومێدی هەیە بگات بەپەروەردگاری خۆی‌و باوەڕی بە دوارۆژ هەیەو بەو هیوایە ئیش دەكات با ئیشی چاك بكات‌و لەبەندایەتی پەروەردگاری خۆیدا هیچ هاوبەشێكی بۆ دانەنێت‌و جگە لە رەزامەندی ئەو زاتە مەبەستی كەسێكی تر نەبێت. جا هەروەك لە پێشەوە باسكرا كردەوەی چاك ئەوەنیە كە خاوەنەكەی بە چاكی بزانێت بەڵكو كردەوەی چاك ئەوەیە كە ئەم دوومەرجە كە لەم ئایەتەدا هاتوە تێیدا بێت:

**یەكەم**: ئەو كردەوە بەو شێوە ئەنجام بدرێت كەلە شەرعدا هاتوە چونكە پێغەمبەرمانﷺ فەرمویەتی: { مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَد/متفق علیه/ واتە: هەركەسێك ئیشێك بكات كە فەرمانی ئێمەی لە سەر نەبێت ئەو كردەوەیە لێی وەرناگیرێت‌و دەدرێتەوە بە كوڵیا}

**دووهەم**: مەرجیش ئەوەیە كە: لەو كردەوەیەدا تەنها مەبەستی ﷲ بێت‌و كەسی تێدا نەكات بەهاوبەش. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَنَا أَغْنَى الشرَكَاءِ عَنْ الشرْكِ مَنْ عَمِلَ عَمَلًا أَشْرَكَ فِيهِ مَعِي غَيْرِي تَرَكْتُهُ وَشِرْكَهُ /مسلم وغ ه/ ﷲ كە زۆر بەرزو گەورەیە دەفەرموێ: من بێ نیازترینی هەمو هاوبەشانم لەوەی كە بكرێم بەهاوبەش لەگەڵ كەسدا، جا هەركەسێك كردەوەیەك بكات‌و لەئەو كردەوەدا كەسێكی تر بكات بە هاوبەشی من، ئەوە من ئەو كردەوەیەی لێ وەرناگرم‌و وازی لێدەهێنم بۆ ئەو كەسەی كە كراوە بە هاوبەشی من. واتە: پەروەردگار تەنها كردەوە شەرعییەك وەردەگرێت كە تەنها مەبەست لەو رەزامەندی ئەو زاتە بێت.

جا بۆیە یەكێك لە دوعاكانی ئیمامی عومەر ئەوەبو كە دەی وت: (اللهم اجْعَلْ عَمَلي كُلَّهُ صَالِحاً واجْعَلْهُ لِوَجْهكَ خَالِصاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فيه شَيْئاً/ ئەی خودایە هەموكردارەكانم بۆ چاك بكەو هەموی پاڵفتەكەرەوە بۆ خۆت‌و بەشی هیچ كەسێكی تێدا مەهێڵە}.

١٩ سورەتی مەریەم ٩٨

سورەتی مەریەم کە سورەتی نۆزدەهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، نەوەدو هەشت ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چلو چوارەمەو پاش سورەتی (**فاطر**) و پێش (**طه**) دابەزیوە، لە قورئاندا سیو چوار جار ناوی خاتون مەریەم هاتووە، کە سێ جاری لەم سورەتەدایە، وە ئەم سورەتەش بەناوی ئەم ئافرەتە پاك داوێنە دەناسرێت، چەند ئایەتێکی سەرەتای ئەم سورەتە یەکێك بو لەو هۆ گرنگو کاریگەرانەی کە کاری کردە سەر پاشای حەبەشە، کاتێ کە جەعفەری ئامۆزای پێغەمبەرﷺ باسەکەی عیساو مەریەمی بۆ خوێندەوە، جا ئەوە بو وتی: ئەمەو ئەوەی کە موسا هێناویەتی لەیەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون، جا خۆزگە پیاوانی گەورەو ناودارانی ئەمڕۆش هەمویان وەك ئەو پاشایە ژیرو زانا بونایەو خۆشبەختی خۆیان وگەلو وڵاتیان بەدەست بهێنایەو هەم دنیایان بخواردایەو هەم قیامەتیش.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) کاف، ها، یا، عین، صاد، هەر خوا خۆی مەبەستی ئەم پیتانە دەزانێت، ئینجا (اللّٰه) داستانی زەکەریاو یەحیای کوڕیمان بە کورتی بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢) ئەمە باسی ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆیە لەگەڵ بەندەی خۆیدا کە زەکەریایە کە پڕ لە پەندو ئامۆژگاریە بۆ باوەڕدارن، ناوی زەکەریای پێغەمبەر حەوت جار لە قورئان لە سورەتی ئالی عیمران‌و ئەنعام و ئەنبیاو ئەم سورەتەدا هاتوە،

(٣) کاتێ کە بە شێوەیەکی نهێنی هاواری کردە لای پەروەردگاری. بەڵێ ئەم باسە لە سورەتی ئالی عیمراندا هاتوە کە کاتێ زەکەریا مەریەمی دەدی کە چۆن پەروەردگار لەو تەمەنە کەمەی دا ڕێزی لێگرێتوەو ئەو میوەو ڕزقە تایبەتیانەی بۆ ناردوە، ئەویش دڵی گەرم بو بۆ پیری خۆی‌و خێزانی‌و نەبونی منداڵێك کە لە پاش خۆی جێنشینی بێ، جا لە تاریکای شەودا کە کاتی وەرگیرانی دوعاو پاڕانەوەیەو تا لۆمەیش نەکرێت کە چۆن پیاوێك لەم ئاخرەی تەمەنیدا داوا لە پەروەردگار دەکات کە منداڵی پێ بدات بە نهێنی‌و بە بێ ئەوەی کە کەسێك ئاگای لێ بێت، دەستی کرد بە پاڕانەوەو هاواری کردە لای پەروەردگاری‌و شکاتی بارودۆخی خۆی‌و خێزانەکەی بە پەروەردگای ڕاگەیاند،

(٤) وتی: ئەی پەروەردگارم بەراستی ئێسقانم هەموی لاواز بوەو سەرم هەموی سپی کردوەو دەزانم بە شێوەی سروشتی تازە منداڵمان نابێ، بەڵام تۆ توانات هەیە کە ئەو نیعمەتەم پێ ببەخشیت، وە ئەی پەروەردگارم چەندێ کە هاوارم لێکردویت بە

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكۡرُ رَحۡمَتِ رَبِّكَ عَبۡدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيّٗا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ ٱلۡعَظۡمُ مِنِّي وَٱشۡتَعَلَ ٱلرَّأۡسُ شَيۡبٗا وَلَمۡ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيّٗا ﴿٤﴾ وَإِنِّي خِفۡتُ ٱلۡمَوَٰلِيَ مِن وَرَآءِي وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا فَهَبۡ لِي مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا ﴿٥﴾ يَرِثُنِي وَيَرِثُ مِنۡ ءَالِ يَعۡقُوبَۖ وَٱجۡعَلۡهُ رَبِّ رَضِيّٗا ﴿٦﴾ يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسۡمُهُۥ يَحۡيَىٰ لَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ مِن قَبۡلُ سَمِيّٗا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَكَانَتِ ٱمۡرَأَتِي عَاقِرٗا وَقَدۡ بَلَغۡتُ مِنَ ٱلۡكِبَرِ عِتِيّٗا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ شَيۡـٔٗا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجۡعَل لِّيٓ ءَايَةٗۚ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾

دەستی خاڵی نەگەڕاومەتەوەو نائومیدت نەکردوم، جا ئەم جارەش نائومێدم مەکەو لەڕەحمەتی خۆت بێ بەشم مەکە.

(٥) جا بە ڕاستی من ترساوم لەوەی کەوا خزمەکانم لە دوای خۆم ڕوو بکەنە خراپەو تاوان‌و کەس نەبێ ئامۆژگاریان بکات‌و ئەوانەش کە لە دوای من دەبن بە سەرپەرستو چاوساغیان بەرەو دین‌و چاکەکاری نەیانبەن، وە ژنەکەم نەزۆکەو منداڵی نابێت، جا ئەی خوایە لە لایەن خۆتەوە کەسێکم پێ بدە کە جێگام بگرێتەوەو ببێ بە پێغەمبەرو سەرپەرستی گەلەکەم بکات.

(٦) لە خۆم‌و ئالی یەعقوب پێغەمبەرایەتی‌و عیلم بە ئیرس ببات‌و ئەرکی ڕێنمای گەلەکەم بگرێتە ئەستۆو وایشی لێ بکەی کە بەشێوەیەك ڕەفتار بکات کە تۆ لێی ڕازی بی‌و ئەوەندە نیعمەتی پێ بدە کە ئەویش ڕازی بێت‌و لەناو چاکەکاراندا خۆشەویستی بکەیت. یەعقوب بۆ مەبەستێکی دنیایی ڕووت داوای منداڵ ناکات، بەڵکو ئەوکەسێك شك نابات کە لە دوای خۆی دڵسوزی گەلەکەی بێت‌و ڕێگای ڕاستیان پیشان دات، بۆیە داوا دەکات لە پەروەردگاری کە چۆن دوعاکانی پێشوی لێ وەرگرتوە ئاوەهاش ئەم دوعاییەی لێ وەرگرێت‌و کوڕێکی چاکەکاری وای پێ بدات کە لە دوای خۆی بمێنێتەوەو ڕێنمونیکەرێك بێت بۆ گەلەکەی‌و خۆشەویستی لای (اللّٰه)و بەندە چاکەکانیشی بێت، جا

يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿١٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا فَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا مَّقۡضِيّٗا ﴿٢١﴾ ۞ فَحَمَلَتۡهُ فَٱنتَبَذَتۡ بِهِۦ مَكَانٗا قَصِيّٗا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلۡمَخَاضُ إِلَىٰ جِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ قَالَتۡ يَٰلَيۡتَنِي مِتُّ قَبۡلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسۡيٗا مَّنسِيّٗا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحۡتِهَآ أَلَّا تَحۡزَنِي قَدۡ جَعَلَ رَبُّكِ تَحۡتَكِ سَرِيّٗا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّيٓ إِلَيۡكِ بِجِذۡعِ ٱلنَّخۡلَةِ تُسَٰقِطۡ عَلَيۡكِ رُطَبٗا جَنِيّٗا ﴿٢٥﴾

پەروەردگار نزاکەی وەرگرتو فریشتەی ناردە لای زەکەریاو مژدەی کوڕێکی پێداو پێی وت:

(٧) ئەی زەکەریا ئێمە موژدەت پێ ئەدەین بە کوڕێك کە ناوی ئەو کوڕە "یحیا"یە لە پێش ئەمەوە ئێمە ئاوەها ناوێکمان بۆ کەس دانەناوە یان پێش تر وێنەی کوڕی ئاوا خۆگرو خواناسمان بەدی نەهێناوە. ناوی یەحیا پێنج جار لە قورئاندا هاتوە کە دووجاری لەم سورەتەدایە. وشەی ﴿سَمِيًّا﴾ دەگونجێ بەمانای هاوناو یان هاوشێوەبێت والله اعلم. جا زەکەریا کە ئەم موژدەیەی بیست زۆری بەلاوە سەیر بو،

(٨) لەبەر ئەوە وتی: ئەی پەروەردگارم من چۆن دەبێت کوڕم ببێت لە حاڵێکدا کە خێزانم نەزۆکەو منداڵی نابێت وە منیش لە پیریدا بەو پەڕی گەیشتوم، وتراوە خێزانی زەکریا خوشکی مەریەم بوە جا هەر بۆیە پێغەمبەرمان لە فەرمودەی ئیسراومیعراجدا بە {إبـ ـ ا الة / اللبيهقي، صحه الالبا / واتە، دوو پورزاکان. ناویان دەبات}

(٩) فریشتەی مەئمور وتی: هەر ئاوایە (ﷲ)ی خاوەن هێزو دەسەڵات کوڕتان پێ ئەداو پەووەردگاریشت دەفەرموێ: ئەوە لای من زۆر ئاسانە خۆ ئێمە تۆمان پێش تر دروستکردوە لە حاڵێکدا کە تۆ هەر هیچ نەبویت واتە ئێوە کە پێش تر هیچ نەبوون کردنی بەم زەلامە دەی ئایا ئێستا کە ئێوە پیر بوون ناتوانێت واتان لێ بکات کە منداڵتان هەبێت؟ ئەوە لای پەروردگار زورئاسانە. ئینجا زەکەریا ئەوەندە پێخۆشحاڵبو زۆری پێخۆشبو کە بزانێت کەی ئەو منداڵەیان دەبێت بۆ ئەوەی کە دڵی بەتەوای وەقرە بگرێتو لە دوای گەیشتن بە "علم اليقين"، "عين اليقين"یشی دەست کەوێت لەبەر ئەوە داوای کرد لە ﷲ،

(١٠) وتی: ئەی پەروەردگارم نیشانەیەکم پیشان بدە، ﷲ فەرموی: نیشانەکەت ئەمەیە کە تۆ ناتوانیت سێ شەو قسە بکەی. لە سورەتی ئالی عمران دا دەفەرموێ: سێ رۆژ، کەوابو سێ شەووسێ رۆژ تۆ ناتوانی قسەی عادی بکەی، وە ئەمە وانیە کە بە هۆی نەخۆشی یان لاڵی بێت، بەڵکو تۆ ساغیتو دەتوانی یادو زیکری ﷲ بکەیت، تەنها ناتوانی لەگەل خەڵك دا قسە بکەی ئەمەیش هەرخۆی لە خۆیدا موعجیزەیەکی گەورەیە کە زمانی تەواو بێ بۆ زیکر، بەڵام نەتوانێ قسە بکات .

(١١) جا زۆری نەبرد لە جێگای نوێژەوە هاتە ناو گەلەکەیو ویستی قسە بکات تەماشای کرد قسەی بۆناکرێت، ئەوسا پاش دڵنیابون هێمای بۆ کردنو بەئیشارەت تێی گەیاندن کە بەیانیانو ئێواران تەسبیحاتو یادی ﷲ بکەن، کە ﷲ خەڵاتێکی گەورەی پێداون جا ئیتر زەکەریا یەقینی پەیدا کرد کە خوا بەم زوانە ئەوکوڕەی پێ دەدا، بەڵێ پەووەردگاری زاناو بەتوانا بەو پیاوو ئافرەتە پیرە لەو تەمەنەدا ئەو کوڕەی پێدانو کردی بە پێغەمبەرو نیگای کردە لایو فەرموی:

(١٢) ئەی یەحیا ئەو کتێبەی پێمداوی بەهەمو هێزەوە بگرەو بە باشی لێی تێبگەو فەرمانەکانمان بە چاکی ئەنجام بدە، وە یاساو بەرنامەی خۆمانمان پێداو کردمان بە پێغەمبەر لە حاڵێکدا کە ئەو هێشتا منداڵ بو.

(١٣) جا لەلایەن خۆمانەوە سۆزو میهرەبانیمان پێبەخشی تا ئیشو کاری بۆ ئاسان بکرێتو خۆشەویستی گەلەکەی بێتو پاکی لەهەمو رەوشتێکی نارێکیشمان پێدا، وە ئەو مرۆڤێك بو کە خۆی دەپاراست لەهەر شتێك کە پێچەوانەی بەرنامەی ﷲ بووایەوفەرمانەکانی بەچاکی جێبەجێ دەکرد.

(١٤) جا وامان لێ کرد کە چاك بێت لەگەڵ دایكو باوکی دا، وە ئەو ملهوڕو تاوانکار نەبو، واتە: حەقی خواو ماڧ بەندەکانی خوای بەتایبەت دایكو باوکی بەچاکی جێبەجێ دەکرد، ئینجا پەروەردگار ئەو منداڵە بەرێزە کە دروستکراوو پەروەردەکراوی خۆیەتی ئاوا ئەلاوێنێتەوەو دەفەرموێ:

(١٥) جا سەلامی لێ بێ لەو رۆژەی کە لە دایك بووەو لە ئەو رۆژەی کە ئەمرێت، وە لە ئەو رۆژەی کەزیندو دەکرێتەوە، واتە: لە هەمو کاتێك لەدنیاو دوارۆژ دا یەحیای پێغەمبەر بە سەلامی پەروەدگاری گوڵباران دەکرێتو رێزی لێ دەگیرێت، سەلامێك کە دەبێ بە هۆی سالمو‌بێزیانبون لە شەڕی شەیتانەکانو سزاو سەختیەکانی دوارۆژیش. ئینجا لە دوای ئەوەی کە ﷲ باسی چۆنیەتی لە دایك بونی یەحیای بۆ کردین دەچێتە سەر باسی چۆنیەتی لە دایك بونی عیسا کە بەسەرهاتەکەی لەبەسەرهاتی یەحیا سەرسوڕهێنەرترەو دەفەرموێ:

(١٦) ئەی محمد ﷺلەم قورئانەدا داستانی مەریەمی کچی عیمران باس بکە بۆ گەلەکەت ئەوکاتەی کە بۆ پێویستی خۆی بەرەو رۆژهەڵات دور کەتەوە، جا ئەم دور کەوتنەوە یان بۆ گۆشەگیری‌و خەڵوەتو بۆ عیبادەتکردن بووە یان بۆ خۆ پاك کردنەوەو خۆشۆردن بوە، والله اعلم.

(١٧) جا لەوێ پەردەیەکی بۆ خۆی دروستکرد بۆ ئەوەی نەیبینن تا ئەو پێویستی خۆی ئەنجام دەدات، جا لەو کاتەدا ئێمە رۆحی خۆمان کە جبرەئیل بو ناردە لای، جا ئەویش خۆی کرد بە شێوەی پیاویکی رێکو پێك بۆ ئەوەی مەریەم زۆر نەترسێت، جا کاتێ دی نارەحەتو نیگران بوو ترسا کە نیەتی خراپی هەبێت بۆیە پەنای بردە پەروەردگاری،

(١٨) وتی: بێگومان من پەنا دەگرم بەو زاتە زۆربەسۆزە لە خراپەو دەستدرێژی تۆ، جا ئەگەر تۆ پیاوێکی پارێزکاریو لە خواترسی ئەوە من خۆم خستوەتە پەنای ئەو زاتەوە.

(١٩) ئەویش بەمەریەمی وت: من نێرراوی خوای تۆم بۆ ئەوەی منداڵێکی پاك وخاوێنت پێ ببەخشم.

(٢٠) مەریەمیش وتی: من چۆن منداڵم ئەبێت لە حاڵێکدا کە من مێردم نەبوەو تێکەڵاوی حەڵاڵم لەگەڵا نەکراوە، وە هەروەها زینا کاریش نەبووم دەی ئیتر چۆن منداڵم ئەبێت؟

(٢١) وتی: وایە تۆ مێردت نەکردوەو زینا کاریش نیت بەڵام تۆ منداڵت ئەبێو ئەمە بریاری (ﷲ)یە، پەروەردگاری تۆ دەفەرموێ: ئەوە لای من زۆر ئاسانەو ئەمانەوێ بیکەین بە نیشانەیەك بۆ ئەوەی کە خەڵك توانایی‌و زانایی خوای خۆیانیان بۆ دەرکەوێتو سۆزو رەحمەتێکیش بێت لەلایەن ئێمەوە بۆ تۆو بۆ پەیڕەوانی ئەم منداڵەیش، وەئەمە هاتنە دی فەرمانێکە دەمێکە جێ بەجێ کراوەو لە "لەوحولەحفوز"دا تۆمارکراوە. جا وەکو لە ئایەتی تردا هاتوە ئەو فریشتە بەرێزە فوی کرد بە یەخەی مەریەم دا.

(٢٢) جا ئەویش گورج باردار بو، ئینجا لەترسی تانەو تەشەردانو سەرزەنش کردن لەگەلەکەی دوور کەوتەوە

(٢٣) ئەوسا ژانی منداڵ بوون گرتی‌و ناچار لەبەر نارەحەتی چوە لای بنە دارخورمایەکی وشك بۆ ئەوەی پاڵی پێوە بدات، جا بیری لەم رووداوە گرنگە بێ وێنەی خۆی کردوەوە هەرچی هێنای‌و بردی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەبو بۆ وەڵامی گەلەکەی‌و دڵنیا بو کە بە زیناکەر دایئەنێن لەبەر ئەوە وتی: خۆزگە من پێش ئەم رووداوە بمردمایە، وە خۆزگە من هەر نەبومایەو کەس منی نەدیبایەو نەیناسیمایە، جا لەو کاتە تەنگانەو پڕ ئێش وئازارەدا ﷲ دڵنەوایی کردو فریشتەی نارد کە موژدەیەکی تری پێ بدات.

(٢٤) مەریەم کە لە جێگایەکی بەرز بو، جا فریشتەکەش لەلای خواریەوە بو هەر لەخوارەوە بانگی کردو وتی: خەفەت مەخۆو مەترسە بەراستی پەروەردگارت لە خوارتەوە روبارێك ئاوی بۆ دروستکردی کە ئەو روبارە لە پێشدا نەبوە. تا بەم شێوەیە مەریەم دڵی بەهێزتر ببێو لەگەلەکەی نەترسێتو دڵنیا بێت کە ﷲ بە تەنهای بە جێی ناهێڵێت بەڵکو یارمەتی دەریەتی، وە بزانێ کەﷲ ئارەزۆی لە هەرچی ببێ دەیکات، وە مەریەم کە ئیستا هێزو هەناوی نەماوەو ژانی منداڵبوون گرتویەتی، فریشتەکە موژدەیەکی تری بەهێزکردنی پێدەداو دەڵێت:

(٢٥) دەی ئەو بنە خورما وشکە راوەشێنە کە نەپەلێکی هەیەو نە تەڕی تێدایە کە هەر راتوەشاند لەو دارخورما وشکە خورمای پێ گەیشتوو بەتام دەبارێت بەسەرتا.

(٢٦) جا لەو خورما بخۆو لەو روبارەیش بخۆرەوەو با چاویشت رۆشن ببێتەوە بە بینینی ئەو کورەت کە پێغەمبەرێکە لەپێغەمبەران، جا ئەگەر هاتو کەسێکت بینی ولەم بارەوە پرسیاری لێ کردیت تۆ بڵێ لەسەر خۆمم نەزرم کردوە کە بەرۆژو بم بۆ خوای میهربان، جا ئەمرۆ قسە لەگەڵ هیچ کەسێکدا ناکەم. بەڵێ مەریەم منداڵەکەی بو.

(٢٧) ئەوسا بە ترسێکی زۆرو بە شەرمەوە منداڵەکەی هەڵگرتو هێنایەوە بۆ ناو گەلو خزمانی، جا ئەوانیش کۆبونەوەو زۆر تورەو دلگران بون لە مەریەمو وتیان: ئەی مەریەم بەراستی تۆ شتێکی زۆر خراپت کردوەو کۆڵێك شەرمەزاریت هێناوە.

فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًاۖ فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾ فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥۖ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِي ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَۚ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِي فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍۖ سُبْحَٰنَهُۥٓۚ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْۖ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَاۖ لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾

(٢٨) ئەی خوشکی هارون بەراستی باوکی تۆ پیاوێکی خراپ نەبو، وە دایکشت زینا کارنەبوە دەی تۆ چۆن ئەو کارەت کردوە؟ جا دەگونجێ بەتانەو تەشەرەوە ئەو قسەیان کرد بێ، چونکە هارون بە پیاوێکی چاك ناوی هەبوە، لەسەر ئەوەی کە لەم ئایەتەدا مەبەست لە هارون کێیە زانایان رای جیاوازیان هەیە بەلاَم ئەوەی کە راستە ئەوەیەکە لە حەدیسەکەی موغیرەی کوری شوعبەدا هاتوە کە دەڵێ: پێغەمبەرﷺمنی نارد بۆ نەجران جا خەڵکی ئەوێ سەبارەت بەم ئایەتە پرسیاریان لێکردم وتیان: مەگەر ئێوە لە قورئان دا ئەم ئایەتە ناخوێننەوەکە/ **يَا أُخْتَ هَارُونَ** / ئەی مەریەمی خوشکی هارون کە برای موسایە؟ لە حاڵێکدا بەهەزاران ساڵ لەنێوانی عیساو موسادایە؟! لەراستیدا منیش نەمزانی چۆن وەلاَمیان بدەمەوە، جا کاتێك کە گەڕامەوە بۆلای پێغەمبەرﷺئەم پرسیارەم پێگەیاند پێغەمبەرﷺ فەرموی: ( **ألا أخْبَرْتَهُمْ أنهُمْ كَانُوا يُسَمونَ بِأَنْبِيَائِهِمْ وَالصالِحِ قَبْلَهُمْ** /مسلم وغ ە/ بۆ پێت نەگوتن کە بەنی ئیسرایيل ناوی پێغەمبەران‌و پیاو چاکانی پێشویان لە منداڵەکانی خۆیان دەنا)

واتە: مەبەست بە هارون لەم ئایەتەدا هارونی برای موسا نیە، بەڵکو کەسێکی تری خزمی نزیکی مەریەم بووە. جا مەبەستیان ئەوەبو کە تۆ لە دایك‌و باوك‌و بنەماڵەیەکی ئاوایت چۆن توشی داوێن پیسی بوییت؟

(٢٩) جا ئەویش ئاماژەی کرد بۆ لای منداڵەکەی کە گوایا لەو بپرسن گوتیان: ئەوە تۆ چی دەڵێیت: چۆن ئێمە لەگەڵ منداڵێکی ناو لانکەدا قسە بکەین؟ ئەوە گاڵتەمان پێ دەکەیت؟! ئێمە لە تۆ ئەپرسین؟! جا بە فەرمانی ﷲ منداڵەکە هاتە قسە.

(٣٠) گوتی: من بەندەی (ﷲ)م‌و ئەویش کتێبی پێداوم وکردومی بە پێغەمبەریش.

(٣١) جا ﷲ کردومی بە مایەی خەیرو بەرکەت لە هەر کوێدابم و ئامۆژگاری کردووم بۆ ئەنجامدانی نوێژو زەکات دان هەتا ماوم.

(٣٢) خۆ ئامۆژگاریشی کردوم کە چاك بم لەگەڵ دایکم دا جا ئەو زاتە منی نەکردوە بە مرۆڤێکی ملهوڕی بەدبەخت کە خۆ بە زل بزانم بەرامبەر بە (ﷲ)و بەندەکانی ﷲ . ئەم چەند رستە جوان‌و تەواوە قسەی ئەو منداڵە کۆرپە بوو تا معجزەیەك بێت لە سەر پاکی دایکی‌و پێغەمبەرایەتیەکەی خۆی، عیسا کە دەست بە قسە دەکات پێش هەمو شتێك خۆی بە عەبدو بەندەی ﷲ دەناسێنێت، بەلاَم دواتر گاورەکان زیادەڕەویان تێدا کردو بە خواو بە کوڕی خوا ناوی دەبەن، لە راستیدا ئەوان دژ بەم قسەیەی عیسا رەفتار دەکەن. ئینجا باس لە پێغەمبەرایەتی‌و بەجێهێنانی بەندایەتی خۆی دەکات‌و لە دوایش دا باس لە هەڵسوکەوتی خۆی دەکات بەرامبەر بە بەندەکانی خوا پێش هەمویان دایکێتی، بۆیە دەڵێت: ﴿بِوَٰلِدَتِي﴾ وە ناڵێت: (**بوالدي**) تا تێیان بگەیەنێت کە ئەو خەلاَتێکە کەﷲ بە مەریەمی داوە بە بێ باوك، وە دەڵێت: خوا منی نەکردوە بە مرۆڤێکی ﴿جَبَّارًا﴾ کە پێم وابێت کە هیچ کەس حەق‌و ئەرکێکی بەسەرمەوە نیە، دیارە کە عیسا باس لە شتانێك دەکات کە لە عیلمی ﷲ تێپەری کردوەو بۆ ئەو دانراوە، ئەگینا ئیستا ئەو منداڵێك زیاتر نیە جا ئەمەش بەڵگەیەك بو بۆ بەرپەرچدانەوەی قەدەرییەکان هەروایش لە مالیکی کوڕی ئەنەسەوە هاتوە کە دەڵێ: (**ما أشَدّها على أهلِ القَدر، أخَبر عيسى ا قَضَى من أمره، و ا هو كائن إ أن وت**". چەند سەختە لەلای قەدەرییەکان ئەمەی کەعیسا هەواڵی داوە بەوەی کە بڕیاری پەروەردگار تێپەڕیوە لەبارەی ئەوەوەو ئەوەیش کە روو دەدات بۆی هەتا دەمرێت} عیسا لە پاش ئەم قسانە وتی:

(٣٣) سەلاَم‌و هێمنی‌و ئاسودەیی لە سەرمنە لەو رۆژەی کە لەدایك بووم ولەو رۆژەی کە ئەمرم، وەلەو رۆژەیش دا کە زیندو دەکرێمەوە، واتە: لەهەمو قۆناغەکانی ئەم دوو ژیانەدا من لە ژێر چاودێری (ﷲ)دام وخۆی چاودێرو پارێزگارمە.

(٣٤) لەبارەی عیسای کوڕی مەریەمەوە قسەی ڕاستو حەق هەر ئەوەیە کە باسمان کرد کە ئەوان گومانیان تێیدا هەیەو ئەڵێن: کوڕی خودایەو چەندین قسەی بێ سەروبەری تر؟!

(٣٥) ﷲ منداڵی نیەو پاكو بێگەردە لەو درۆیەی کە ئەوان ئەیکەن، هەرکاتێ ویستی ئیشێ بکات هیچی ناوێت بێجگە لەوەی بفەرموێ ببە ئیتر دەست بەجێ ئەو ئیشە ئەبێ، دەی بۆ ئەبێت بە دووری بزانن کە ﷲ عیسای بە بێ باوك دروستکردوە، ئینجا خوای خاوەن دەسەڵاتو زانا درێژە بەفەرمایشتەکانی ئەداتو لەسەر زمان عیسا دەفەرموێ:

(٣٦) ئەوسا بێگومان کەﷲ پەروەردگاری منەو پەروەردگاری ئێوەشە، دەی ئێوەش بیپەرستن ئا ئەمەیە ڕێگای ڕاستو ئەوەیە قسەی ڕاست کە عیسا بەندەی خواو پێغەمبەریەتی بە بێ باوکیش لەمەریەمەوە هێنایە ئەم ژیانە، جا پەروەردگاری ئەوو ئێوە تەنها (ﷲ)یەو نە خێزانی هەیەو نە منداڵی هەیەو نە هاوبەش ونە وێنەی هەیەو هەر ئەو زاتەشە کە ئەبێ بەندایەتی بۆ بکرێت، بەڵام پاش بەرز کردنەوەی عیسا پەیڕەوانی یەك دەس نەمانەوە وەك ﷲ دەفەرموێ:

(٣٧) کۆمەڵەکانی بەنی ئسرائیلی لەنێوان خۆیاندا سەبارەت بەعیسا ناڕێك بوون، جا هەندیکیان ئەیان وت: عیسا کوڕی خوایەو هەندیکیان ئەیان وت: خوای سێهەمە (الله - مريم - عیسا)!؟ کە ئەم دووانە هەردووکیان کافرن وەبەشێکیان حەقیان گرتە بەرو وتیان: نە خوایەو نە کوڕی خوایە بەڵکو بەندەی خوایەو پێغەمبەرێتیو لە مەریەم بوە، ئینجا ﷲ بۆ ئەوە بیر بکەنەوە ڕوی قسەی ئەکاتە بێباوەڕانو هاتنی قیامەت ئەخاتە پێش چاویانو دەفەرموێ: وای بۆ ئەو کەسانەی کە بێباوەڕن لەو ڕۆژە گەورەی کە ئامادەی ئەبن کە ڕۆژی قیامەتەو لەو کۆبونەوەو ئامادەبونەی کە هەمو کردارو وتارو نوێتەکان ئاشکرا دەبنو هیچکەس ناتوانێ عەیبی خۆی بشارێتەوە. وەخوای زاناو کار بەجێ دەفەرموێ:

(٣٨) ئەو ڕۆژەی کە دێنە لامان ئای چەند چاك دەبیسن وچەند چاك دەبینن، وەك دنیانیە کە بۆ بیستنو بینینی حەقو ڕاستی خۆیان کەڕو کوێر بکەن، بەڵام ستەمکاران ئەمڕۆ کە لە ژیانی دنیادان وان لە گومڕاهیەکی ئاشکراداو بیر ناکەنەوەو سود لەم ژیانە وەرناگرنو حەیوان ئاسا هەر وان لەبیری خەوو خواردنداو ئامادەی ئەو کۆچە ناچاریە نین کە لەم ژیانە بۆ هەمیشە جیایان دەکاتەوە، جا خوای میهرەبان دەفەرموێ:

وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِى عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّى قَدْ جَآءَنِى مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِىٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ ۖ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّىٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِى يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ۖ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ ۖ وَٱهْجُرْنِى مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ ۖ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ بِى حَفِيًّا ﴿٤٧﴾ وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُوا۟ رَبِّى عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّى شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَٰبِ مُوسَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخْلَصًا وَكَانَ رَسُولًا نَّبِيًّا ﴿٥١﴾

(٣٩) ئەی محمدﷺبیانترسێنە لە ڕۆژی داخو خەفەت کە ئەو کاتەیە کە ئیش جێ بەجێ دەکری و بەهەشتی بۆ بەهەشتو دۆزەخی بۆ دۆزەخ ومردن نامێنێت، لە حاڵێکدا ئەمڕۆ ئەوان لە بێ ئاگایدانو باوەڕ ناهێنن کە ئاوا ڕۆژێکی گەورە چاوەڕوانیان دەکات، مەبەست لە ﴿ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ ﴾ ئەو ڕۆژەیە کەمردن لەناو ئەبرێتو بەهەشتییەکان بێ ترس ئەبن لە مردنو کافرانیش هیچ هیواو ئومێدێکیان نامێنێ بۆ ڕزگار بون لە ئاگری دۆزەخ. وەك پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ: (**إذَا دَخَلَ أَهْلُ الجَنةِ الجَنةَ وَأَهْلُ النار النارَ يُجَاءُ بِالمَوْتِ كَأنهُ كَبْشٌ أَمْلَحُ فَيُوقَفُ بَيْنَ الجَنةِ وَالنار فَيُقَالُ يَا أَهْلَ الجَنةِ هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا قَالَ فَيَشْرَئِبونَ فَيَنظُرُونَ وَيَقُولُونَ نَعَمْ هَذَا المَوْتُ قَالَ فَيُقَالُ يَا أَهْلَ النار هَلْ تَعْرِفُونَ هَذَا قَالَ فَيَشْرَئِبونَ فَيَنظُرُونَ وَيَقُولُونَ نَعَمْ هَذَا المَوْتُ قَالَ فَيُؤْمَرُ بِهِ فَيُذْبَحُ قَالَ وَيُقَالُ يَا أَهْلَ الجَنةِ خُلُودٌ لا مَوْتَ وَيَا أَهْلَ النار خُلُودٌ لا مَوْتَ قَالَ ثم قَرَأ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ الحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ الأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ قَالَ وَأَشَارَ بِيَدِهِ.** /منفق عليه/ هەرکاتێ ئەهلی بەهەشت چونە بەهەشتو ئەهلی ئاگر چونە ناو ئاگرو شەفاعەتی شەفاعەتکاران تەواو بو کەس نەما کە ئەم لاولای پێ بکرێت مردن ئەهێنرێت وەك بەرانێکی خوڵەمێشی قەڵەو لە نێوان بەهەشتو دۆزەخدا ڕادەگیرێو بانگ دەکرێتو دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشتی ئائەمە دەناسن؟ ئەوانیش ملیان بەرز ئەکەنەوەو تەماشا ئەکەنو

ئەڵێن: بەڵێ دەیناسین ئەوە مردنە، ئینجا ئەبێژرێت ئەی خەڵکی ناو ئاگر ئا ئەمە دەناسن؟ ئەوانیش ملیان بەرز ئەکەنەوەو تەماشا دەکەن ودەڵێن، بەڵێ دەیناسین ئەوە مردنە، جا فەرمان دەدرێتو لە پێش چاوی هەموویان سەردەبڕێت، پێغەمبەرﷺ فەرموی: جا دەوترێت: ئەی خەڵکی بەهەشت، ئێوە ئیتر هەتا هەتاییەنو مردن نەماوە، وە بانگ دەکرێتە ئەهلی ناو ئاگریشو دەوترێت ئێوەش هەتا هەتاییەنو ئەوە مردنیش نەما، ئەبو سەعید ئەڵێ :پێغەمبەری خوا ﷺ پاش ئەم فەرمودەیە ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿جا بیان ترسێنە لەرۆژی داخو خەفەت ئەوکاتەی کە کار جێ بەجێ کرا لە حاڵێکدا ئەوان هەر وان لەبێ ئاگاییدا﴾ بەدەستی هێمای بۆ دنیا کردو فەرموی :خەڵکی دنیایی لە دنیادا بێ ئاگانو بیر لەورۆژە سەختەناکەنەوە}

جا تەماشا بکەنو بزانن کە ﷲ چەندە میهرەبانە سەبارەت بەبەندەکانی کە پێش هاتنی ئەو رۆژە فەرمان دەدات بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کە لەو رۆژە گەورە بیانترسێنێت تا لەو رۆژەدا داخو خەفەت نەخۆنو خۆیان بەژیانی دنیا سەرگەرم نەکەنو وانەزانن کە هەرگیز لێی جیانابنەوەو بەرەو جیهانێکی گەورە ترو تەمەنێکی بێ نیهایەت نارۆن، وە با بزانن ئەم دنیایە بو کەس نامێنێتەوە ،

(٤٠) جادەفەرموێ: بێگومان ئێمەین کە زەویو ئەوەی کە بەسەری دایە لە ناوی دەبەینو نایهێڵینو هەموی بۆ ئێمە دەمێنێتەوە، وە لە پاش مردن هەموویان بۆلای ئێمە دەهێننەوە. جا بەم شێوەیە داستانی مەریەم وعیسا(سەلامیان لێ بێ) کۆتایی هات، ئینجا پەرەوەردگار چەند پێغەمبەرێکمان بەکورتی بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٤١) ئەی محمدﷺلەم کتێبەدا کە قورئانە باسی ابراهیم بکە کە بێگومان ئەو زۆر راستگۆو پێغەمبەر بووە.

(٤٢) ئەو کاتەی کە بەباوکی وت: ئەی باوکی خۆشەویستم بۆ بەندایەتی دەکەی بۆ شتێك کە نە هیچ دەبیسێت ونەهیچ دەبینێتو هەرچەند بەندایەتیشی بۆ بکەیت هیچ سودێکت پێ ناگەیەنێت ؟

(٤٣) ئەی باوکی خۆشەویستم بەراستی بەشێك لە زانیاری وا هاتوەتە لای من کە تۆ شتی وات بۆ نەهاتوە کە بریتیە لە تێگەیشتن لە یەکخوا پەرستی راستو دروست، جا ئەگەر ئەتەوێ زانایانە بژیت تۆ پەیرەوی من بکەو بە گوێم بکە رێنماییت ئەکەم بۆ رێگایەکی راست کە بتگەیەنێت بەرەزاو رەحمەتی ﷲ. ئیبراهیم چەند بە نەرمو نیانییەوە باوك یان مامی بت پەرەستی بانگ دەکات بۆ یەکخواپەرستی، ئیبراهیم نالێ: (یاأبی) ئەی باوکم بەڵکو دەڵێت: (یابت) ئەی باوکی خۆشەویستم، نالێت: من زانام وتۆنەزانی دەبێ پەیڕەویم بکەیت بەڵکو وا ئەدوێت کە گوایە تۆیش عیلمو زانیاریت هەیە بەڵام ئەو بەشە زانیاریەی کە هاتوەتە لای من تۆ نیتە، جا ئەگەر بەگوێم بکەیت خەیرت دەس دەکەوێت، بەراستی بانگخوازی راستەقینە دەبێ ئاواشەیتان پسێن بێت نەك هەر خەریکی شەڕە قسەو مەردم تۆرێن بێت، لەباتی شەیتان پسێن شەیتان سەپێن بێ.

(٤٤) ئەی باوکی خۆشەویستم بە گوێ شەیتان مەکەو مەی پەرستە بێگومان کە شەیتان سەرپێچی کەرە لە فرمانی (ﷲ)و دژایەتی ئەو زاتە دەکات. واتە هەرکەس جگە لە (ﷲ) شتێك بپەرستێت ئەوە فەرمانبەرداریو بەندایەتی بۆ شەیتان کردوە، جا تۆیش گوێڕایەڵی شەیتان مەکە و جگە لەو زاتە میهرەبانە شتێکی تر مەپەرستە.

(٤٥) ئەی باوکی خۆشەویستم بێگومان من ئەترسم کە بە هۆی پەیڕەویت لە شەیتانەوە سزای خوات پێ بگات، جا ئەو کاتە ببیت بە دۆستی شەیتانو حیسابی ئەوت بۆ بکرێت. ئەمە گفتوگۆی ئیبراهیم پێغەمبەر بو لەگەڵ باوکیدا کە چەند بە هێواشی وبە نەرمو نیانی لە گەڵ باوکی خۆیدا دووا ئەگەر چی بت پەرستیش بو، جا پێویستە لە سەر هەمو خواناسێکی راستەقینەیە ئاوەها لەگەڵ باوك ودایکیدا قسە بکات، ئینجا گوێ لەوەڵامی باوکێشی بگرەکە چی دەڵێ:

(٤٦) وتی: ئەی ئیبراهیم تۆ وادەردەکەوێ کە پشت لە خواکەی من ئەکەیو بەراستی نازانی؟ سوێند بێت ئەگەر واز نەهێنی لەم قسانەت دڵنیابە کە بەرد بارانت دەکەم و بۆ ماوەیەکی زۆریش دوور بکەوە لێمو هاتوو چۆم مەکە، ئیبراهیم دیسان لە وەڵامی باوکیا خۆین ساردانە.

(٤٧) وتی: سەلامەت لێبێ، من هیچ خراپەیەك بەرامبەر تۆ ناکەم لەمەولاو من لە پەروەردگارم داوای لێ بوردنت بۆ دەکەم، بێگومان ئەو بۆ من زۆر بە سۆزو میهرەبانەو وەڵامی دوعاکانی من ئەداتەوە، ئا بەم شێوەیە ئیبراهیم بەڵێنی دا بە باوکی کە دوعای هیدایەتی بۆ بکات تا ئەو هیدایەتە ببێت بە هۆی لێخۆش بونی پەروەردگار بۆی، جا ئیبراهیم لەسەر ئەو بەڵێنەی رۆیشت تا بە تەواوی بۆی دەرکەوت کە باوکی لە کوفرو بت پەرستی ناگەڕێتەوە، ئەوسا ئیبراهیم وازی هێنا لە دوعا کردن بۆی وەك لە سورەتی تەوبەدا باسکراوە. جا ئیبراهیم وتی:

(٤٨) سا ئیترمن دوور ئەکەومەوە لە ئێوەو لەو شتانەیش کە ئێوە دەیانپەرستن بێجگە لە (ﷲ)ومن ئومێدم وایە کە هەرگیز بەهۆی بەندایەتی وپاڕانەوەم لە پەروەردگارم بەدبەختو بێ بەش نەبمو ﷲ هەموویانم لێ وەر بگرێت. وەك پێغەمبەرمان دەفەرموێت: {مَنْ تَرَكَ شَيْئًا عَوَضَهُ الله خَيْرًا مِنْهُ. / أ د، صحيح الألبا / واتە: هەرکەس لەبەرﷲ واز لەشتێك بهێنێت،ﷲ لە باتی ئەوە پاداشتی بە چاکتر دەداتەوە}

جا کە ئیبراهیمیش نیشتمانو خزمو گەلەکەی بۆ رەزای ﷲ بە جێهێشت، ﷲ پاداشتێکی گەورەی دایەوەودەفەرموێ:

(٤٩) جا لەبەر ئەو راستیو لێ بڕانەی بۆ ﷲ کاتێ کەوازی لێ هێناو دورکەوتەوە لێیانو لەوەیش کە ئەوان جگە لە ﷲ دەیان پەرست بە پاداشتی ئەوە ئێمە ئیسحاقو یەعقوبی کوڕی ئیسحاقمان پێ بەخشی، واتە: بێجگە لەوەی کەلەو تەمەنە پیریەدا کە کوڕمان پێدا لەو کوڕەش کوڕێکی ترمان پێدا و هەموویانمان کردن بە پێغەمبەر سەلامی خوالەهەموویان.

(٥٠) جا لە سۆزو رەحمەتی خۆمان بەوانمان بەخشیو وامان لێ کردن کە زمانی خەڵکی پاش خۆیان هەمیشە بەگەورەو پایە بەرزو رێزەوە ناویان ببەن. بەڵێ بەراستی هەر (ﷲ)یە کە ئەتوانێ بە جوانیو بەرێك وپێکی پاداشتی دۆستانی خۆی بداتەوە، ئیبراهیم بۆ ﷲ وازی لە هەمو شتێك هێنا، (ﷲ)یش رێزێکی وای پێدا هەمو خاوەن ئایننان تا رۆژی قیامەت رێزی بۆ دائەنێن. لەپاشان داستانی موسای کوڕی عیمران ی کوڕی لاهیب ی کوڕی عازیری کوڕی لاوی کوڕی یەعقوب پێغەمبەرمان بەکورتی بۆ دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:

(٥١) ئەی محمدﷺ لەم کتێبەدا کە قورئانە بەسەرهاتی موسا باس بکە، بێگومان ئەو لەلایەن خوای خۆیەوە بەهۆی ئیخلاسو پاکیەك کە هەیبو هەڵبژێررابو خۆ ئەو نێرراوو پێغەمبەریش بو.

لە بارەی جیاوازی مانای (رسولو نبی) یەوە قسە زۆرکراوە نزیکترینیان ئەمەیە کە (رسول): ئەو کەسەیە کە وەحی بۆ هات بێت، وە دەستوریشی پێدرا بێت کەبە خەڵکی رابگەیەنێت. (نبی): ئەو کەسەیە کە وەحی بۆهات بێ ئیتر دەستوری راگەیاندنی پێدرابێ یان نە، واتە: هەمو رەسولێك نەبیە بەڵام مەرج نیە هەمو نەبیەك رەسول بێت، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٥٢) جا ئێمە لە تەنیشتی راستی جیای توری پڕخەیرو بەرەکەتەوە بانگمان لە موسا کردو نزیکمان کردەوە لە

وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنۡ هَدَيۡنَا وَٱجۡتَبَيۡنَآۚ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْۤ سُجَّدٗاۤ وَبُكِيّٗا۩ ﴿٥٨﴾ ۞ فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا ﴿٥٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ شَيۡـٔٗا ﴿٦٠﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٍ ٱلَّتِي وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعۡدُهُۥ مَأۡتِيّٗا ﴿٦١﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوًا إِلَّا سَلَٰمٗاۖ وَلَهُمۡ رِزۡقُهُمۡ فِيهَا بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿٦٢﴾ تِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِي نُورِثُ مِنۡ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيّٗا ﴿٦٣﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمۡرِ رَبِّكَۖ لَهُۥ مَا بَيۡنَ أَيۡدِينَا وَمَا خَلۡفَنَا وَمَا بَيۡنَ ذَٰلِكَۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيّٗا ﴿٦٤﴾

خۆمانەوەو راستەوخۆ قسەمان لەگەڵ کرد. جا چۆنیەتی ئەو نزیك بونەوە شتێکی نهێنیو نەزانراوە تەنها ﷲ خۆی دەزانێ چۆنە، ئینجا دەفەرموێ:

(٥٣) ئەوسا بە هۆی سۆزو بەزەیی خۆمانەوە داواکارییەکەی موسامان وەرگرت کە داوای لێکردین کە هارونی برای بکەین بەپێغەمبەرو بیکەین بە پشتیوانی. هارون کە چەند ساڵێك لە موسا بەتەمەنتر بووە لە ناو بەنی ئیسرائیلدا بە پیاوێکی رێزدار دەناسرا، ئینجا ﷲ باسی ئیسماعیل دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٤) جا لەم کتێبەدا باسی ئیسماعیل ی کوڕی ئیبراهیم بکە کە بەراستی ئەو راستگۆ بووە لەو پەیمانانەی کەئەیدا بەخواو بەخەڵك و بەچاکی دەیهێنانەدی، وەك ئەو بەڵێنەی کە دای بە باوکی کە خۆگر بێت تا ئەو بتوانێت سەری ببڕێت، وە ئەو نێرراوو پێغەمبەری خوا بووە. پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: {آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلَاثٌ إِذَا حَدَثَ كَذَبَ وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ./متفق عليه/ واتە: نیشانەی موونافق سێ شتە: هەرکاتێ قسەی کرد درۆ ئەکات، وە هەرکاتێ بەڵێنی دا نایباتە سەر، وە هەر کاتێ کرا بەئەمیندار خیانەت ئەکات}

بەراستی پێغەمبەران هەمویان راست بوون لە بەڵێنو قسە کردنو ئەمانەتدا بەڵام ﷲ بۆ رێزلێنان هەر پێغەمبەرێکی بەسیفەتێکی جوانەوە ناوبردوە،

(٥٥) خۆ ئیسماعیل فەرمانی ئەدا بەدەستو دایەرەکەی کە نوێژ بکەنو زەکات بدەن، واتە: هەم حەقی خواو هەم حەقی خەڵکی جێ بەجێ بکەن، وە لەگەڵ خواو لە گەڵ خەڵکدا راست بن جا ئەو لەلایەن پەروەدگاریەوە ئەوەندە چاکەی لەگەل دا دەکرێت تا رازی ئەبێت. ئینجا خوا باسی ئیدریس ئەکاتو دەفەرموێ:

(٥٦) لەم کتبەدا باسی ئیدریس بکە بێگومان ئەویش راستگۆو پێغەمبەر بو.

(٥٧) جا جێگاو پلەو ناوی ئەومان بەرز کردەوە. وە لە فەرمودەی پێغەمبەرمانﷺ سەبارەت بە میعراج هاتوە کە پێغەمبەرمان لە ئاسمانی چوارەمدا ئیدریسی بینیوەوسەلامی لێ کردوە، ئینجا دەفەرموێ:

(٥٨) ئەوانە پێغەمبەرانێکن کە خوای باڵادەست نیعمەتی خۆی رژاندوە بەسەریاندا، ئەوانە هەندێکیان لە منداڵانی ئادەمن وەکو ئیدریس عليه السلام ، وە هەندێکی تریان لە منداڵی ئەو کەسانەن کە لەگەڵ نوح دا هەڵمان گرتنو لە توفان رزگارمان کردن، وەك ئیبراهیم، وە بەشێکیان لە منداڵانی ئیبراهیمن وەك ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقوب، وە هەندێکیش لە منداڵانی یەعقوبن وەك موساو هارون وزکریاو عیسا، ئەوانە هەمویان لە منداڵانی کەسانێکن کە رێنمایمان کردون بۆ رێی راستو هەڵمان بژاردن بۆ پێغەمبەرایەتی، ئەوانە هەر کاتێك ئایەتەکانی خوای خاوەن سۆز بخوێنرێتەوە بەسەریاندا بە حاڵەتی گریانەوە سوجدە ئەبەن بۆالله واتە : پێغەمبەرانو پیاوچاکانو خواناسانی راستەقینە هەر کاتێ فەرمودەی خوایان ئەبیست زۆر بەخێرای گەردنکەچی خۆیان دەرئەخستو دەگریان،

(٥٩) بەڵام دوای ئەوان کۆمەڵێکی تر هاتن نوێژەکانیان فەوتانو لە کاتی خۆیانداو بەرێكو پێکی نەیان دەخوێندو دوای ئارەزۆکانی خۆیان کەوتنو گوێیان بە ئایین نەدا ، جا بەم زوانە ئەوانە دوچاری لەناوچون وبەد بەختی دەبنو بەر سزای دنیاو دوارۆژ دەکەون. پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ: {حُفتْ الجَنةُ بِالْمَكَارِهِ وَحُفتْ النارُ بِالشهَوَاتِ./مسلم وغ ه/ واتە: چوار دەوری بەهەشت بە سەختیو دژواریەکان داپۆشراوەو ئاگری دۆزەخیش بە شەهوتو ئارەزۆکان داپۆشراوە}.

جا ئەوکەسەی کە بەهەشتی دەوێت با خۆی بۆ سەختی ودژوارییەکانە دنیا ئامادە بکاتو ئەوەش شوێنی مەیلو ئارەزۆکانی دەکەوێت با خۆی بۆ ئاگر ئامادە بکات.

(٦٠) مەگەر ئەوکەسەی کەوا تەوبەی کرد بێو کرداری چاکی ئەنجام دابێت، ئەوسا ئا ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتەوەو هیچ ستەمێکیان لێ ناکرێت، کەواتە مەسەلەی نوێژ مەسەلەیەکی زۆرگرنگە چونکە هێڵی پەیوەندی راستەقینەی مرۆڤە لەگەڵ خواداو میعراجی باوەڕدارانەو یەکەم پرسیاری رۆژی قیامەتەو پاك کەرەوەی تاوانو گوناهەو نیشانەی جیاکرنەوەی باوەڕدارانە لە بێباوەڕان، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { بَيْنَ الرجُلِ وَبَيْنَ الشرْكِ وَالْكُفْرِ تَرْكُ الصلَاةِ. /مسلم وغ ه / واتە: نێوانی پیاوو نێوانی شیركو کوفر، واز هێنانە لە نوێژ} جا ئەگەر وازت لێ هێنا موشریك وبت پەرستیت، وە هەر لەسەر ئەم جۆرە فەرمودانەیە کە هەندێ لە زانایان نوێژنەکەر بەکافر دەزانن وەکو مەشهورە لە ئیمام ئەحمەددەوەو قەولێکی ئیمامی شافیعیشە، وە عەبدولای کوڕی شەقیق دەڵێ: (كَانَ أَصْحَابُ مُحَمدٍ صَلى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلمَ لَا يَرَوْنَ شَيْئًا مِنْ الْأَعْمَالِ تَرْكُهُ كُفْرٌ غَيْرَ الصلَاةِ./ الترمذي، ا اكم، صححه الألبا / کەوابو کۆی دەنگی هاوەڵانی پێغەمبەرﷺلە سەر ئەوەیە کە ئەوەی واز لە نوێژ بهێنێت کافرەو لە دین دەرچوە. ئینجا خوای دەسەڵاتدارو زانا باسی ئەو بەهەشتە دەکاتو دەفەرموێ:

(٦١) ئەو بەهەشتانەی کە جێگەی دانیشتنو مانەوەیە، ئەو بەهەشتەیە کەوا ئەو زاتە بەسۆزو بەخشندەیە بەڵێنی داوە بیدات بە بەندەکانی کە لە شتە نهێنیەکانەو باوەڕدار بە بێ ئەوەی کە دیتبێتی باوەڕی پێی هەیە. بەڵێ خوای بەسۆز بەڵێنی بەهەشتی بەوانەی داوە کە لەو کاتو شوێنانەی کە هیچ کەسیان لێوە دیار نیە هەر بەندەیی ئەونو لێی دەترسن، بێگومانیشە کە بەڵێنی الله جێ بەجێ کراو دەبێت.

(٦٢) ئەوان لە ناو ئەو بەهەشتانەدا هیچ قسەیەکی خراپ نابیستن بێجگە لە وشە گەلێکی پاكو جوان وەك زیکریالله و بیستنی قسەکانیو سلاو کردن، سلاوی ئەهلی بەهەشتی لە یەکتریو بیستنی قسەی فریشتەکانو حۆریەکان، وە بەیانیانو ئێواران بە لێشاوو بێ ژمارە خواردنو خواردنەوەی تێدایە بۆیان، واتە: هیچ کاتێ بێ خواردنو خواردنەوە نابن، چونکە لەوێ شەوو رۆژ وەك یەکەو تەنها بەدادانی پەردەکانو لابردنیان شەوو رۆژ دەزانرێت، جا بەو شێوەیە ئێوارەو بەیانیشی دەزانرێت. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {أَولُ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنةَ عَلَى صُورَةِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ وَالذِينَ عَلَى آثَارِهِمْ كَأَحْسَنِ كَوْكَبٍ دُري فِي السمَاءِ إِضَاءَةً قُلُوبُهُمْ عَلَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ لَا تَبَاغُضَ بَيْنَهُمْ وَلَا تَحَاسُدَ لِكُل امْرِئٍ زَوْجَتَانِ مِنْ الْحُورِ الْعِ ـ يُرَى مُخ سُوقِهِن مِنْ وَرَاءِ الْعَظْمِ

وَاللَّحْمِ. وفي رواية، يُسَبِّحُونَ اللهَ بُكْرَةً وَعَشِيا. /متفق عليه/ واتە:
یەکەم کۆمەڵێك کە دەچنە بەهەشت دەموچاوانیان وەك مانگی چواردەیەو دەدرەوشێتەوەو ئەوانەیش کە لە دوای ئەوان دەچنە ناو بەهەشتەوە دەموچاوانیان وەك جوانترین ئەستێرەی پرشنگداری روناکە لە ئاسمانگداو دڵیان وەك دڵی یەك پیاوە کە دڵیان سافەو هیچ رقو قین نیە لەناویاندا، جاحەسادەت نیەو هەریەك لەوان دوو هاوسەریان لەو حۆریە چاوگەورەو سپیو جوانانەیان هەیە کە مۆخی ناوی ئێسقانی لاقیان لە ژێر ئێسقانو گۆشتەوە دیارە... کەبە بەردەوامیش زیکرو یادی ﷲ دەکەن}. جاﷲ دەفەرموێ:

(٦٣) ئەوە ئەو بەهەشتەیە کە ئێمە بەکەلەپورو ئیرس دەیدەین بە بەندەکانمان ئەو کەسەی کە لە خوا ترسەو لە تاوانو خراپە خۆی پاراستوە. پێغەمبەرمانﷺدەفەرموێ: {لَا يَدْخُلُ أَحَدٌ الجَنةَ إِلا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنْ النارِ لَوْ أَساءَ لِيَزْدَادَ شُكْرًا وَلَا يَدْخُلُ النارَ أَحَدٌ إِلا أُرِيَ مَقْعَدَهُ مِنْ الجَنةِ لَوْ أَحْسَنَ لِيَكُونَ عَلَيْهِ حَسْرَةً./البخاري/ واتە:
هەر کەس کە دەچێتە ناو بەهەشتەوە ئەو شوێنەی ناو ئاگری دۆزەخی پیشان دەدرێت کە ئەگەر تاوانبارو کافر بوایە دەچووە ناویەوە تابەهەشتی بەلاوە زۆرتر خۆش ببێتو زیاتر سوپاسی پەروەردگاری بکات کە هیدایەتی داوەو لە شوێنە رزگاری کردوە، وە هەرکەسێکیش کە دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە ئەوشوێنەی ناو بەهەشتی پیشان دەدرێت کە ئەگەر موسڵمانو پیاو چاك بوایا دەچووە ناویەوە تا داخو خەفەتی زۆرتر بخوات}
ئەم ئایەتەش باس لە ئیرس دەکات، چونکە هەروا کە لە فەرمودەکە دا هاتوە هەمو کەسێك لە بەهەشتو لە دۆزەخدا جێگای دیاری خۆی هەیە، جا جێگای ئەوانەی کە دەچنە دۆزەخەوە لە بەهەشتدا دەمێنێتەوەو خوای میهرەبان ئەوەش ئەدات بە باوەڕداران بێجگە لە جێگای خۆیشیان، جا لە ناو مرۆڤیشدا لە هەزار کەس یەك کەس ئەچێتە بەهەشتەوە نۆسەدو نەوەدو نۆی ئەچێتە دۆزەخەوە، خۆ ئەبێ ئیرس باوەڕداران لە بەهەشتەدا چەندێك بێت؟ عەبدوڵای کوڕی عەباس ئەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ وتی بە جوبرەئیلم وت: {مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَزُورَنَا أَكْثَرَ مِما تَزُورُنَا فَنَزَلَتْ.هذه الآية/البخاري،الترمذي،أ د/ واتە: چ شتێك رێگەت لێ ئەگرێ کە تۆ سەردانمان بکەیت زۆر زیاتر لەمەی کە ئێستا دەی کەیت؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارەی پێغەمبەرﷺ دا ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ :

(٦٤) جوبرەئیل وتی: ئێمە ناتوانین دابەزیین مەگەر بە فەرمانی پەروەردگارت، بڕیار هەر بۆ ئەوە لە پێش دەمماندا کە چوەولە پشت سەرماندا کە دێتو لەنێوانیشیاندا کە ئێستایە،

رَبُّ السَّمَٰوَٰتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَاعْبُدْهُ وَاصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا (٦٥) وَيَقُولُ الْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا (٦٦) أَوَلَا يَذْكُرُ الْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا (٦٧) فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَالشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا (٦٨) ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى الرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا (٦٩) ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِالَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا (٧٠) وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا (٧١) ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا (٧٢) وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِلَّذِينَ ءَامَنُوا أَيُّ الْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا (٧٣) وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا (٧٤) قُلْ مَن كَانَ فِي الضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ الرَّحْمَٰنُ مَدًّا حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ إِمَّا الْعَذَابَ وَإِمَّا السَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا (٧٥) وَيَزِيدُ اللَّهُ الَّذِينَ اهْتَدَوْا هُدًى وَالْبَٰقِيَٰتُ الصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ مَّرَدًّا (٧٦)

واتە: هەمو هەڵسو کەوتی ئێمە لە هەمو کاتێکدا بەفەرمانی (ﷲ)یەو تا ئەو فەرمان بەسەر ئێمەدا نەدات ناتوانین هیچ جموجوڵێك ئەنجام بدەین، وە پەروەردگارت هیچی لەبیر ناچێتەوە، هەر کات پێویست بێت بت بینم فەرمانی دابەزینمان بەسەردا ئەداتو ئێمەش بەبێ دواکەوتن دێینە لات بەراستی پەروەردگارت کار بەجێو زانایە.

(٦٥) کە پەروەردگاری ئاسمانان و زەوی وئەوەیە کە لە نێوانیاندایە دەی تۆیش زیاتر بیپەرستەو بەندایەتی بۆ بکە ، ئەوسا خۆت رابگرە لەسەر بەندایەتی ئەو زاتە گەورەو بەدەسەڵاتەو بەردەوام بە لەسەری، چونکە ئەو پەروەردگاری تۆیەو هەموشتت بەدەست ئەوە، ئایا تۆ هیچ وێنەو ناوو زاتێك ئەبینی لەو بچێت کە شیاوی ئەوە بێت کە بیپەرەستی؟ کەوابو تەنها ئەو زاتە بپەرستە کە هیچ هاوبەشو هاوشێوەی نیە نەلەناویاو نەلە زاتیاو نەلە کرداریدا، بەداخەوە لەگەڵ ئەو هەمو بەڵگە گەورەو زۆرانە لەسەر یەکتایو دەسەڵاتی ﷲ هێشتا هەندێ خەڵك لەبارەی زیندو بوونەوەی پاش مردن گومانیان هەیەو بیر لە زانایی‌و هێزی ﷲ ناکەنەوەو نەزانانە دەم لە نهێنیەکان دەکوتن.

(٦٦) جا ئەو مرۆڤە ئەڵێ: ئایا هەرکاتێ مردم تازە لە دواییدا زیندو دەکرێمەوەو لە گۆڕ دەردەهێنرێم؟ ئەم دروستکرنە وەی

دووهەمەی زۆر بەلاوە دورە، جا (اللّه)یش لە وەڵامیاندا دەفەرموێ:

﴿٦٧﴾ ئایا ئەو مرۆڤە بیر ناکاتەوە کە ئیمە ئەومان لەسەرەتادا دروستکردوە، لە حاڵێکدا کە ئەو هیچ نەبوە؟ جا ئایا کامیان دژوار ترە ئەوەی کە هەر لە نەبون دروستکرێت یان ئەوەی کە لە سەر شێوازو پاشماوەی پێشویی دروستکرێتەوە؟ ئاشکرایە بەبەراوردی ئێمە یەکەمیان دژوارترە بەڵام هەردوو لەلای ئەو زاتە زۆر ئاسانن.

﴿٦٨﴾ سا سوێند بە پەروەردگارت ئەی محمدﷺ ئەوانو شەیتانەکانی هاورێ وگومراکەریان زیندو دەکەینەوەو کۆیان دەکەینەوە بۆ حیساب، لە پاشان هەمویان ئامادە دەکەینو لەسەر ئەژنۆ، لەسەر لێواری دۆزەخ دادەنیشن.

﴿٦٩﴾ پاشان لە هەمو دستەو کۆمەڵێك کامیان کە زۆرتر لە بەرامبەر ئەو زاتە میهربانەوە ملهوڕی کرد بێت ئەوە دەر دەهێنین و توڕی دەدەینە ناو ئاگرەوە. ئەوە نەبێ کە ئێمە نەزانین کە کامیان زۆرتر کوفرو ستەمو تاوانی کردوەو دژبە فەرمانەکانی اللّه راوەستاوە.

﴿٧٠﴾ لە پاشان ئێمە چاك ئەزانین کە کامیان شایستەترە کە پێش هەمویان بخرێتە ناو دۆزەخەوە. بەڵێ خوای زاناو کار بەجێ خۆی مرۆڤ و خەیاڵەکانی ناو دەرونی دروست دەکات ئیتر چۆن دەبێ نەزانێ کێ خراپە کارترو ستەمکارترە؟ بەڵێ دۆزەخ لەبەردەم هەمو کەسێك دایەو کەسی لێ رزگار نابێ وەکو دەفەرموێ:

﴿٧١﴾ جا سوێند بێت ئەی مرۆڤ هەموتان ئەبێ سەر بە دۆزەخ دا بکەن ئەمە فەرمانێکی جێبەجێ کراوو نەگۆڕی پەروەردگارتە کە بێشك دەبێ بەجێ بێت.

﴿٧٢﴾ ئینجا ئەوانەی کە لە اللّه ترساون وخۆیان لە خراپە پاراستوە ئێمە لەدۆزەخ رزگاریان دەکەینو دەیانبەینە ناو بەهەشتەوە، بەڵام ئەوانەی کە ستەمکارن لەسەر ئەژنۆ لە ناو دۆزەخ دا دەیان هێڵینەوە، جا بت پەرست وکافران بۆ هەمیشە لەوێدا ئەبن بەڵام تاونبارانی باوەڕدار بەگوێرەی تاوانەکەی سزا دەدرێنو پاشان بە شەفاعەتی پێغەمبەران و پیاوچاکان وشەهیدانو سۆزو بەزەی پەروەردگارخۆی لە ئاگری دۆزەخ رزگاریان ئەبێ. بەڵێ ئەی باوەڕداران، وە ئەی خەڵکینە بەگشتی تەماشا بکەن وچاك ورد ببنەوە چ رۆژێکی پڕ مەترسی ودرێژو پڕ داخ وخەفەت لەپێش دەمتایە کە پێویستی بەتێشوی چاكو زۆرە، وە تەنها لەم تەمەنە کورتەدا ئەتوانی بەدەستی بهێنیت جا ورد بەرەوەو زوو فریای خۆت بکەوە، هەندێك ئەڵێن ئەو چونە دۆزەخەی راستان تەنها پەڕینەوەیە لەسەر پردی دۆزەخ کە مەشهورە بەپردی سیرات، وە تا نامەی خوا نەیەت بۆ باوەڕدار هیچ باوەڕدارێکیش ماوەی پێ نادرێت کە لەو پردە بپەڕێتەوەو هەرکەس بە گوێرەی کردەوەی خۆی بەسەر ئەو پردە دا تێدەپەڕێت، پیغەمبەرﷺدەفەرموێ:{ يُوضَعُ الصِّرَاطُ بَيْنَ ظَهْرَانَيْ جَهَنَّمَ عَلَى حَسَكٍ كَحَسَكِ السَّعْدَانِ ثُمَّ يَسْتَجِيزُ النَّاسُ فَنَاجٍ مُسَلَّمٌ وَمَخْدُوجٌ بِهِ ثُمَّ نَاجٍ وَمُحْتَبَسٌ بِهِ وَمَنْكُوسٌ فِيهَا./ابن ماجه، أ د، صحه الألبا / واتە: پردی سیرات لە نێوان دۆزەخ دا لە سەر دڕكو داڵێك وەك دڕكو داڵە قولاپیەکانی گیای سەعدان دادەنرێت پاشان خەڵك بەسەریدا تێدەپەڕن ، جا هەندێکیان بە سالمی رزگار دەبنو هەندێکیان بریندار دەبن، پاشان لە ئەنجامدا رزگاریان دەبێتو تێدەپەڕنو هەندێکیان رێیان پێدەگیرێتو ناتوانن لێی تێ بپەڕنو هەندێکیشیان دەکەونە خورەوە بۆ ناو ئاگری دۆزەخ}

بەشێك لە زانایان پێیان وایە مەبەست لە ﴿وَارِدُهَا﴾ چونەناوە کە یەکێك لە بەڵگەکانیان حەدیسەکەی حەفسەی دایکی موسڵمانانە کە دەڵێت: پێغەمبەرﷺفەرموی:{ إني لأرجو ألا يدخل النار أحد إن شاء الله تعالى ممن شهد بدرا والحديبية. واتە: ئۆمێدی ئەوە دەکەم کە ئێنشائەڵلا هیچکام لە وانەی کە لە غەزای بەدرو لە حودەیبییە دا ئامادەبوون نەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، جا کە وای فەرمو منیش وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ئەی ئەوە نییە کە اللّه دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴾ پێغەمبەرﷺفەرموی: ئەی نەتبیستوە کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوا وَّنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴾ لەم فەرمودەیە کە ئیمامی مسلمو جگە لەویش هێناویانە ئەوە دەردەکەوێت کە حەفسە وا تێدەگات کە مەبەست لە﴿وَارِدُهَا ﴾ چونە ناوەوە، هەمو خەڵك دەگرێتەوە، جا پێغەمبەریش دان دەنێت بەو تێگەیشتنەدا بەڵام درێژەی ئایەتەکەی بیردەخاتەوەو تێی دەگەیەنێت کە ئەگەر چی ئەهلی بەدرو حودەیبییە وەك هەمو خەڵك دەچنە ناو دۆزخو لێی تێدەپەڕنو ئەو سوێندەی پەروەردگاریش بەجێ دێت بەڵام توشی هیچ سزاو ئێشو ئازار نابن، واتە: مەبەستی فەرمودەکە لە نەچونە ناو ئاگر توش نەبونە بە سزای ئاگر. جا جارێکی تر ئەمان هێنێتەوە سەر دنیاوو هەڵوێستی ئەو بێباوەڕانەمان بۆ باس ئەکات کە ئێستا لە ناو سزای پەروەردگارنو دەفەرموێ:

﴿٧٣﴾ خۆ هەرکاتێ ئایەتە رۆشنکەرەوەکانی ئێمەیان بۆ بخوێنرێتەوەو راستو ناڕاستیان بۆ شی بکرێتەوە لە جیاتی ئەوە

باوەڕ بهێنن‌و رو بکەنە خوا پەرستی، ئەو بێباوەڕانە کە بەگاڵتەوە بە سوك تەماشای باوەڕداران ئەکەن‌و ستەمکاران‌و ملهوڕان‌و تاوانبارانیان بەلاوە چاکترە، بە باوەڕداران دەڵێن: دەی کام لەو دوو کۆمەڵە ئێمە یان ئێوە شوێنی خۆش ترەو مەجلیسی گەرم‌و گوڕترە؟ واتە: دنیا پەرستان تەنها تەماشای ژیانی خۆش‌و مەجلیسی گەرم‌و سامانی زۆر دەکەن کە ﷲ بە کافرانی داوەو باوەڕداران بەزۆری لەو شتانە بێ بەشن جا ئەوان ئەمە بە نیشانەی لەسەر حەق بوون‌و چاکی‌و خۆشبەختی خۆیان دەزانن، هەر بۆیە ﷲ بە توندی دەمکوتیان دەکات.

(٧٤) لە حاڵێکدا ئێمە لە پێش ئەواندا زۆر وڵاتمان لەناو بردووە کە ئەوان هەم لە ماڵ وساماندا‌و هەم لەسەرو سیمایاندا زۆر زۆر لەمان جوانترو سەروەت‌و ساماندارتر بوون، واتە: سەروەت‌و سامان‌و سیمای جوان بەڵگەی چاکی نیە.

(٧٥) بڵێ بەراستی ئەوانەی کە لە گومڕاهیدان ئەگەر دەوڵەمەندو جێگاو سیما شیرینن بەرواڵەت، جا لەبەر ئەوەیە کە ئەوان تەنها دنیایان هەیە هەر چەند کە لاسارو خراپیشن، ئەو زاتە میهرەبانە لەم دنیایەدا شتی چاکی زۆریان پێ دەدات‌و ماوەیشیان دەداتێ هەتا ئەو کاتەی کە چاویان دەکەوێت بەهاتنە دی ئەوەی کە بەڵێنیان پێدراوە، جا یان سزا ئەدرێن یان قیامەت دێت ، ئەوسا ئەو کاتە چاك ئەزانن کێ خراپترین جێگە و لاواز ترین سەربازی هەیە. وە ئەمەش وەڵامی ئەو پرسیارەیان بو کە لە دنیادا بە باوەڕدارانیان دەوت: تەماشا بکەن‌و بزانن کاممان سەروت‌و سامان‌و دەستەو دایەرەی زۆرترمان هەیە؟

(٧٦) جاﷲ ئەوانەی کە ڕێگای راستیان گرتوە رێنمایی‌و رێ رونکردنەوەیان بۆ زیاد دەکات تا بە چاکی لەم ژیانەدا پەروەردگاری خۆیان بناسن‌و بەچاکی بەندایەتی بۆ بکەن ، وە ئەو چاکانەی کە ئەمێننەوەو لە لای پەروەردگارت ئەی محمدﷺهەر ئەوە پاداشت‌و ئەنجامی چاکترە بۆ خاوەنەکەی.

لەسەر ﴿ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ ﴾ لە سورەتی الکهف دا قسەمان کردوە، واتە: ئەگەر چی بێ باوەڕان بەدنیای خۆیان دەنازن ، بەڵام با بزانن ئەوانە لە ناو دەچن‌و هەر بەندایەتی بۆ پەروەردگارو کردارە چاکەکانن کە دەمێننەوە کە وتنی ئەم وشانەو پەیڕەوی کردنی ماناکانی بەشێکە لەو چاکانە (سبحان ا وا مد ولا اله الا ا وا اک ولا حول ولا قوة الا با ) کە ئەمانە هەمویان هۆی خێرو خۆشی‌و زیادبونی نازو نیعمەتی بەهەشتن بۆ ئەو کەسەی کەبەراستی لەدنیادا بەکاریان دەهێنێ‌و لە کردارو وتاریدا رەنگ ئەداتەوە، بەڵام ئەمانە هەتا بەنهێنی‌و

أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي كَفَرَ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالٗا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلۡغَيۡبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴿٧٨﴾ كَلَّاۚ سَنَكۡتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلۡعَذَابِ مَدّٗا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأۡتِينَا فَرۡدٗا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ لِّيَكُونُواْ لَهُمۡ عِزّٗا ﴿٨١﴾ كَلَّاۚ سَيَكۡفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمۡ وَيَكُونُونَ عَلَيۡهِمۡ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّآ أَرۡسَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمۡ أَزّٗا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعۡجَلۡ عَلَيۡهِمۡۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمۡ عَدّٗا ﴿٨٤﴾ يَوۡمَ نَحۡشُرُ ٱلۡمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحۡمَٰنِ وَفۡدٗا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرۡدٗا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمۡلِكُونَ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحۡمَٰنِ عَهۡدٗا ﴿٨٧﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗا ﴿٨٨﴾ لَّقَدۡ جِئۡتُمۡ شَيۡـًٔا إِدّٗا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِنۡهُ وَتَنشَقُّ ٱلۡأَرۡضُ وَتَخِرُّ ٱلۡجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوۡاْ لِلرَّحۡمَٰنِ وَلَدٗا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لِلرَّحۡمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّآ ءَاتِي ٱلرَّحۡمَٰنِ عَبۡدٗا ﴿٩٣﴾ لَّقَدۡ أَحۡصَىٰهُمۡ وَعَدَّهُمۡ عَدّٗا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمۡ ءَاتِيهِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَرۡدًا ﴿٩٥﴾

کاتی تەنیاییدا بێ خێری زیاترەو دورترە لە ریایی و خۆ پیشاندانەوە، ئەڵێن خەباتی کوڕی ئەرەت قەرزی بەلای عاسی کوڕی وائیلەوە بوو داوای لێ کرد ئەویش وتی پێت نادەمەوە تا بێباوەڕ نەبی بە محمد ﷺ ئەڵێ: منیش وتم: بێباوەڕ نابم پێی تا ئەو کاتەی تۆ نەمریت‌و زیندو نەکرێیتەوە، ئەویش وتی: ئایا من پاش مردن زیندو دەکرێمەوە؟! دەی مادام وایە لەوێ کاتێ گەڕامەوە بۆ ناو ماڵ‌و منداڵم بۆت دەبژێرمەوە؟ جا لە وەڵامی ئەو تاوانبارەدا ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە کە دەفەرموێ:

(٧٧) ئایا نابینیت‌و ئاگات لەو کەسە نیە کە بێباوەڕە بە نیشانەکانی ئێمەو ئەڵێ لەوێ ماڵ و منداڵان پێ ئەدرێتەوە وەك چۆن لە دونیادا پێمان دراوە، واتە: ئەڵێ ئەگەر قیامەت راست بێ لەوێش ئێمە هەر خاوەن ماڵ‌ومنداڵ دەبین؟! جا ﷲ دەفەرموێ:

(٧٨) ئایا نهێنی ئەزانێ کە ئەوەی بۆ دابین کراوە؟ یان لەلای ئەو زاتە میهرابانەوە پەیمانێکی وەرگرتوەو دڵنیایە کەﷲ بەڵێنی خۆی ئەباتە سەر؟ واتە کام لەو دوو بەڵگانەیی بەدەستەوەیە کە ئەوەندە دڵنیاییەو خۆی بە بەهەشتی دەزانێ‌و پێی وایە کە ماڵ‌و منداڵیشی لە بەهەشتدا پێ ئەدرێتەوە؟ ئاشکرایە کە لە غەیب نازانێت، چونکە هەر زاتی (ﷲ)یە کە لێی ئاگادارە، وە لەو باوەڕدارەیش نیە کە ئەو زاتە بە هۆی ئیمان‌و باوەڕیەوە بەڵێنی نازو نیعمەتی بەهەشتی پێدابێت، بەراستی ئەم مرۆڤە بێباوەڕەو

درۆزنیشەو بەدرۆوە خۆی سەر گەرم کردوە، خوای بالأدەستیش دەفەرموێ:

(٧٩) شتی وەها نیەو نابێتو ئێمە دەی نووسین ئەو قسەو درۆو ناڕەوایەی کە ئەو دەیڵێتو لە رۆژی دوایشدا سزای نەبڕاوەی بەسەردا دەدەین. واتە: ئەوەی کە لە پاشە رۆژدا بۆی دابین کراوە نازو نیعمەت نیە بەڵکو سزایەکەو رۆژ بە رۆژ لە سەری زیاد دەکرێت،

(٨٠) خۆ ئەو ماڵ و منداڵەی کە ئەو ئەنازێ پێیدا ئێمە لێی دەسێنینەوەو خۆی بەتەنها دێت بۆ لای ئێمە بۆ حساب نەماڵی لەگەڵ دایەو نەمنداڵ. بەڵێ عاسی کوڕی وائیل ئەگەرچی لە دوای دابەزینی ئەم ئایەتانە ماوەیەکی زۆری بۆ رەخسا بۆ ئەوەی لەو هەڵەیە بگەڕێتەوە بەلأم بەڵێنەکانی ﷲ بەجێ هاتو پێش هیجرەتی پێغەمبەرﷺ لە مەکە دا بە کافری مرد. پاشان پەروەردگار زیاتر ئیشە ناشیرینەکانی ئەوان ئاشکرا ئەکاتو دەفەرموێ:

(٨١) ئەمانە بێجگە لە ﷲ چەند خوایەکی تریان داناوە بۆ خۆیان تا ئەوان بەهۆی ئەو خوایانەوە ببن بە خاوەن هێزو دەسەلأتو لە سزای دوا رۆژیش لە ئەماندا ببن. بەلأم ﷲ دەفەرموێ:

(٨٢) نەخێر وانیە، ئەوانە نەك نابن بە هۆی بەرزیو رزگاریان بەڵکو بەم زوانە لە رۆژی قیامەت دا هەر ئەو خوایانەی کە ئەوان بۆ خۆیانیان داناوە لە ترسی سزای ﷲ بەو بەندایەتیەی ئەوان بۆ خۆیان نارازینو دانی پێدانانێن، بەڵکو ئەوان لەرۆژی قیامەت دا ئەبن بە دوژمنیانو لە دژیشیان قسە دەکەن.

(٨٣) ئایا تۆ نابینی ئەی محمدﷺ کە ئێمە شەیتانەکانمان واز لێ هێناوەو رەوانەمانەمان کردونەتە سەر بێباوەڕان تا سەریان لێ تێك بدەنو هەڵیان نێن بۆ ئەنجامدانی ئیشی خراپو تاوان.

(٨٤) کەوابو تۆ پەلەت نەبێ لەسەر سزاو لەناو بردنیان، چونکە ئێمە بێ ئاگا نین لێیان، بەڵکو ئێمە رۆژەکانی تەمەنیان کە ژمارەیەکی دیاری کراوە بۆ دەژمێرینو تا رۆژێك لەو تەمەنەیان مابێ دەبێ بمێنن و هەر کاتێکیش کە رۆژەکانی تەمەنیان دوای هات بە بێ دواکەوتن دەگەن بەسزای ئیشە خراپەکانی خۆیان.

(٨٥) جا یادی ئەوە رۆژە بکەن کە ئێمە پارێزکاران کۆ ئەکەینەوەو بەرەو رەحمان نوێنەر ئاسا بەرێ ئەکرێن بۆ وەرگرتنەوەی پاداشتی ئیشە چاکەکانیان.

(٨٦) خۆ هەر لەو کاتەشدا پاڵ بەو تاوانبارانەوە ئەنێین لە حاڵێك دا کە ئەوان زۆر تینویانەو رایان دەکێشین بەرەو دۆزەخ،

(٨٧) کە ئەوان خاوەنی هیچ پاڵ پشتو شەفاعەتکارێك نین، بەلأم ئەو کەسەی کە بە هۆی ئیمانو کردەوەی چاکەوە پەیمانی شەفاعەتی لە خوای بەخشندە وەرگرتوە کە باوەڕدارانن دەتوانن تکاو پاڵپشتیو شەفاعەتی یەکتری بکەن، چونکە خوای میهرەبان لە کتێبەکەی داو لە سەر زمانی پێغەمبەرەکەی ئەو بەڵێنەی پێداون وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموی: {مَا مُجَادَلَةُ أَحَدِكُمْ فِي الْحَق يَكُونُ لَهُ فِي الدنْيَا بِأَشَد مُجَادَلَةً مِنْ الْمُؤْمِنِ لِرَبهِمْ فِي إِخْوَانِهِمْ الذِينَ أُدْخِلُوا النارَ قَالَ يَقُولُونَ رَبنَا إِخْوَانُنَا كَانُوا يُصَلونَ مَعَنَا وَيَصُومُونَ مَعَنَا وَيَحُجونَ مَعَنَا فَأَدْخَلْتَهُمْ النارَ قَالَ فَيَقُولُ اذْهَبُوا فَأَخْرِجُوا مَنْ عَرَفْتُمْ مِنْهُمْ قَالَ فَيَأْتُونَهُمْ فَيَعْرِفُونَهُمْ بِصُوَرِهِمْ فَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ النارُ إِلَى أَنْصَافِ سَاقَيْهِ وَمِنْهُمْ مَنْ أَخَذَتْهُ إِلَى كَعْبَيْهِ فَيُخْرِجُونَهُمْ فَيَقُولُونَ رَبنَا قَدْ أَخْرَجْنَا مَنْ أَمَرْتَنَا قَالَ وَيَقُولُ أَخْرِجُوا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ دِينَارٍ مِنْ الْإِيمَانِ ثُم قَالَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ نِصْفِ دِينَارٍ حَتى يَقُولَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ وَزْنُ ذَرةٍ./النسائي، ابن ماجه، صححه الألبا / لە دنیادا هیچ دەمەقاڵەو مشتو مڕێکتان نەکردوە کە توندتر بێت لەوەی کە باوەڕداران بۆ پارێزگاری لەو برایانەیان کە چونەتە ناو ئاگری دۆزەخەوە لە گەڵ پەروەردگاریاندا دەیکەن.فەرموی: دەڵێن ئەی پەروەردگارمان: ئەوانە براکانی ئێمەنو لەگەڵ ئێمە دا نوێژیان دەخوێندو رۆژویان دەگرتو حەجیان دەکرد، جا ئێستا تۆ ئەوانت خستوەتە ناو ئاگرەوە؟ ئەفەرموێ: ﷲ پێیان دەفەرموێ: بڕۆن کام لەوان دەناسن دەریان بهێنن ئەوسا ئەوانیش دەڕۆن بۆ لایانو بە سەرو سیمایاندا دەیانناسنەوە، جا هەندێکیان تا نیوەی لاقیو هەندێکی تریان تا قاپی پێی سوتاوە، ئینجا دەریان دەهێننو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەوەی کە فەرمانت پێداوین دەرمان هێنا، جا پەروەردگار دەفەرموێ: دەری بهێنن ئەوەش کە بە ئەندازەی قورسای دینارێك لە دڵیدا ئیمان هەیە، پاشان دەفەرموێ: ئەوکەسەش کە بە ئەندازەی قورسای نیو دینار لە دڵیدا ئیمان هەیە تا سەر ئەنجام، دەفەرموێ: ئەو کەسەش کە بە ئەندازەی قورسای گەردیلەیەك لە دڵیدا ئیمان هەیە دەری بهێنن}

وە هەروەها ئەوانەی کە کردەوەی چاکیان هەیە ئەو کردەوانە لەو دنیادا تکاو شەفاعەتیان بۆ دەکەن. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {الصيَامُ وَالْقُرْآنُ يَشْفَعَانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يَقُولُ الصيَامُ أَيْ رَب مَنَعْتُهُ الطعَامَ وَالشهَوَاتِ بِالنهَارِ فَشَفعْنِي فِيهِ وَيَقُولُ الْقُرْآنُ مَنَعْتُهُ النوْمَ بِاللْيْلِ فَشَفعْنِي فِيهِ قَالَ فَيُشَفعَانِ./ أ د، الط ا ، صححه الالبا / رۆژوو قورئان لە رۆژی قیامەتدا شەفاعەت دەکەن بۆ بەندە، رۆژو دەڵێ: ئەی

پەروەردگارم لە رۆژدا بەرگریم لە خواردنو ئەنجامدانی ئارەزۆکانیم کرد جا تکاو شەفاعەتم لە بارەیەوە وەرگرە، وە قورئانیش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم منیش رێگای خەوی شەوم لێگرت بو، جا شەفاعەتم لە بارەیەوە وەرگرە جا ئەو دووانە بە شەفاعەتکاروەردەگیرێنو تکای بۆ دەکەن.}

ئینجا الله زیاتر پەردە لەسەر قسە ناشیرینەکانی بێباوەڕانو گاورو جوەکان لا ئەداتو دەفەرموێ:

(٨٨) خۆ وتویشیانە: الله منداڵی هەیە؛

(٨٩) بەحەقیقەت شتێکی زۆر خراپو گەورەتان بەدەمداهاتوە.

(٩٠) ئاسمانەکان لە داخی ئەو قسەیەی کە ئێوە دەیکەن خەریکن لەت لەتو گاڵ گاڵ ببنو زەویش خەریکە پارچە پارچە ببێتو چیاکان خەریکن لەتو پەت ببن وبکەونە خوارەوە.

(٩١) لەبەر ئەو تاوانە گەورەی کە وتیان رەحمان منداڵی هەیە.

(٩٢) لەحاڵێکدا کە رەحمان پێویستی بە منداڵ نیەو ئەوە شتێکی نە گونجاویشە.

(٩٣) چونکە هیچ شتێك نیە نە لە ئاسمانانو نە لە زەویدا مەگەر لە رۆژی قیامەتدا دێتە خزمەت (الله)و دان بە بەندایەتی خۆیدا دەنێت، دەی الله بەندەی خۆی چۆن دەکات بە منداڵو هاوشانی خۆی؟!

(٩٤) جا بەحەقیقەت الله هەر هەموویانی ژماردووە، وەبە ژماردن ژمارەی کردون، واتە: هیچی لێ ون نابێت نە مرۆڤ و نە کردارەکانی مرۆڤ، وە هەر کەس بە تۆڵەی خۆی ئەگات.

(٩٥) خۆ هەمویان لەرۆژی قیامەتدا بە تەنهایی دێنە لای خۆی. دەی ئەو بەندەگەلە چۆن دەبێ منداڵی (الله) بن ؟!

(٩٦) بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە بەم زوانە رەحمان خۆشەویستی خۆی بەوان دەبەخشێتو ئەبن بەمرۆڤێکی خۆشەویست لە ئاسمانانو لە زەویدا. ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەرمانەوەﷺ دەگێرێتەوە کەفەرمویەتی: {إذا أحب الله عبدًا نادى جبريلَ إني قد أحببتُ فلانًا فأحِبَّهُ قال فَيُنادي في السماءِ ثم تَنزِلُ له المَحبةُ في أهلِ الأرضِ فذلكَ قولُ اللهِ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحاتِ سيجعلُ لهم الرحمنُ ودا. وإذا أبغضَ الله عبدًا نادى جبريلَ إني أبغضتُ فلانًا فَيُنادي في السماءِ ثم تَنزلُ له البغضاءُ في الأرض./ الترمذي، صححه الالبا / واتە: هەرکاتێ الله بەندەیەکی خۆشویست بانگ دەکاتە جوبرەئیلو دەفەرموێ: بێگومان من فلاڵن بەندەم خۆش ئەوێت تۆش خۆشت بوێت، پێغەمبەرﷺ فەرموی: جا جوبرەئیلیش بانگ دەکاتە ئەوانەی کە

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ ٱلۡمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوۡمٗا لُّدّٗا ﴿٩٧﴾ وَكَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّن قَرۡنٍ هَلۡ تُحِسُّ مِنۡهُم مِّنۡ أَحَدٍ أَوۡ تَسۡمَعُ لَهُمۡ رِكۡزَۢا ﴿٩٨﴾

## سُورَةُ طه ٢٠ ١٣٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طه ﴿١﴾ مَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لِتَشۡقَىٰٓ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذۡكِرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلٗا مِّمَّنۡ خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ وَٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلۡعُلَى ﴿٤﴾ ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَمَا تَحۡتَ ٱلثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجۡهَرۡ بِٱلۡقَوۡلِ فَإِنَّهُۥ يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ وَأَخۡفَى ﴿٧﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ ﴿٨﴾ وَهَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذۡ رَءَا نَارٗا فَقَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِقَبَسٍ أَوۡ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدٗى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ يَٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّيٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخۡلَعۡ نَعۡلَيۡكَ إِنَّكَ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوٗى ﴿١٢﴾

لەئاسمانانو پێیان دەگەیەنێت کە الله فلان کەسی خۆش دەوێت، جا ئێوەش خۆشتان بوێت لە پاشان ئەو خۆشەویستیە دائەبەزێتە ناو خەڵکی سەر زەوی‌و ئەوانیش خۆشیان دەوێت ئەوەیە کە خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿بەم زوانە رەحمان خۆشەویستی خۆی دائەنێت بۆیان﴾

وەهەرکاتێك الله رقی لە بەندەیەك بو جوبرەئیل بانگ دەکاتو دەفەرموێ: من فلاڵن بەندەم خۆش ناوێ ئەویش بانگ دەکاتە ئەوانەی کە لەئاسمانانو لەپاشان ئەو رق وقینەی الله دائەبەزێتە سەر خەڵکی زەوی‌و ئەوانیش خۆشیان ناوێ. ئینجا خوای میهرەبان باسی ئاسانی ئەم قورئانە پڕ پیتوخێرە دەکاتو دەفەرموێ:

(٩٧) سا بەراستی ئێمە ئەم قورئانەمان ئاسان کردوە لە سەر زمانت تا تۆ مژدەی بەهەشت بدەیت بەو کەسانەی کەلە خوا ئەترسنو خۆیان لە تاوان ئەپارێزن تا بەم قورئانە بترسێنی گەلێکی لارو لاسار بەڵکو بیر بکەنەوەو واز لە خراپە بهێنن.

(٩٨) ئەوسا چەندە خەڵكو ولات لەپێش ئەواندا بوون کە لەناومان بردن خۆ ئەمانە لەوان بەتواناو بەهێزتر نین دەی ئایا تۆ هەست بە هیچکام لە وان دەکەیتو دەیانبینی؟ یان ئایا هیچ دەنگێکی هێواشیشیان لێ ئەبیست؟ واتە: ئەو هەمو خەڵکە بەدەسەڵاتو بەهێزەی پێش ئەوانمان لە ناو بردو کەسیش توانای قسەیەکی هێواشی نیە، جا ئەمانە تاکەی بیر نا کەنەوەو ناترسن لە (الله)و لە تۆڵەی دوا رۆژ؟!

٢٠ سورەتی تاها ١٣٥

سورەتی تاها سورەتی بیستەمی قورئانە، سەدو سی‌و پێنج ئایەتە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، بناغەی باسەکەشی هەر ئەو شتانەن کە لە سورەتە مەکیەکاندا باسیان لێکراوە وەك یەکخواپەرستی‌و پێغەمبەرایەتی‌و زیندو بونەوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چل‌و پێنجەمەو پاش سورەتی (مر )و پێش (الواقعة) دابەزیوەو لەکۆکردنەوەی قورئانیش دا پاش سورەتی مەریەمە، لە سورەتی مەریەم دا بە کورتی باسی بەسەرهاتی موسای کرا و لەم سورەتەشدا بە رونی چەند بەسەرهاتی ئەو بە درێژی باس دەکرێت، هەندێك لە زانایان پێیان وایە (تاها) ناوێکە لە ناوەکانی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ ، ئەم سورەتە یەکێکە لەو سورەتانە کە پێغەمبەرمانﷺ بە (المِئِ ) سەددەکان، ناویان دەبات‌و دەفەرموێ: {وَأُعْطِيتُ مَكَانَ الزَّبُورِ الْمِئِ - / ا د، صححه الالبا / جا لە باتی زەبور سورەتە سەدیەکانم پێدراوە} مەبەستی ئەو سورەتانەن کە ئایەتەکانیان لە سەد زیاترە.

بەناوی اللَّهِ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) تا ها، دوو پیتە لە پیتە پارچە پارچەکانی سەرەتای هەندێك لەسورەتەکانی قورئان‌و هەراللَّهِ خۆی دەزانێ مەبەست لەو دووپیتە چییە.

(٢) ئێمە ئەم قورئانەمان نەناردوە بۆ تۆ کە تۆ بەد بەخت بکات‌و توشی ئازار و پەژارەت بکات. وەك بێباوەڕان دەیان وت ئەم قورئانەی محمدﷺبە تەواوی بووەتە هۆی دەردەسەری‌و ئازار بۆی، کەواتە بەهۆی ئەوەی کە گەلەکەت باوەڕ بە قورئان ناکات بەو داخ‌و خەمە خۆت لەناو مەبەو ئەوەندەش کە لە بەندایەتی پێت دەکرێت هەر ئەوەندە بەجێ بهێنە کە لەراستی دا ئەم قورئانە پەندو ئامۆژگاری‌و عیلم‌و تێگەیشتنە، وانیە کەئەو بێباوەڕانە دەڵێن بەڵکو،

(٣) ئەوقورئانە تەنها هەر بۆ ئەوەیە کە ببێتە هۆی بیر خستنەوەو ئامۆژگاری بۆ ئەو کەسەی کە لە پەروەردگاری دەترسێت.

(٤) جا ئەم قورئانە نێرراوێکە لەلایەن ئەو کەسەی کە زەوی‌و ئاسمانە بەرزەکانی دروستکردوە .

(٥) ئەو زاتە زۆر بەسۆزەی کە لە سەر عەرشدایە. ئێمەی باوەڕدار باوەڕمان بە سەقامگیر بونی اللَّهِ لە سەر عەرشەوە هەیە بەو شێوەی کە شایستەی خۆیەتی‌و چۆنیەتیەکەی بۆ ئێمە نادیارەو نایزانین‌و گۆڕانی مانای وشەی (ٱسْتَوَىٰ ) یان باس کردنی چۆنیەتی ئەو سیفەتەی پەروەردگار بڕیاردانە بە بێ عیلم‌و زانیاری لەسەر ئەو زاتە بالأدەستە، جا چ تاوانێك لەوە گەورەترە، وەلەئایەتە موتەشابیهەکانەوباس‌و لێکۆڵینەوە لێی دژی فەرمودەی پێغەمبەرمانە ﷺ.

(٦) ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەوی دایەو ئەوەی کە لە نێوانیاندایەو ئەوەیش کەلە ژێر ئەم خاکەدایە هەموی هەر موڵکی ئەوە. واتە: ئەم بونەوەرە بە گیاندارو بێ گیانیەوە، بە گەورەو بە بچوکیەوە هەموی موڵکی ئەوەو هەر خۆیەتی کە خاوەن‌و بەدیهێنەرو پەروەردگاریان.

(٧) جا ئەگەر بە ئاشکرا قسە بکەی یان بە نهێنی لای اللَّهِ گرنگ نیەو هەردووکیان لەلای ئەو یەکسانە، چونکە بێگومان ئەو زاتە ئەوەی کە مرۆڤ دەیڵێ نهێنی بێ یان شاراوە خۆی دروستی دەکات ئیتر چۆن دەبێ نەیزانێ؟

(٨) اللَّهِ ئەو زاتەیە کە جگە لە ئەو هیچ پەرستراوێکی راستەقینەی ترنیە، هەرچی ناوی بەرزو جوان ترو خاوێن ترە تەنها شایستەی ئەو زاتەیە. ناوانێك کە لە قورئان و فەرمودە سەحیحەکاندا هاتوە ئەگەر بەوانە هاواری لێ بکرێت وەڵام دەداتەوە، هەروەها ناوانێك کە تەنها زاتی اللَّهِ خۆی دەیانزانێت، ئینجا خوا داستانی موسامان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(٩) ئایا قسەو باسی موسات پێ گەیشتوە؟ داستانی موساو پێغەمبەرایەتی ئەو لێرەوە دەست پێ دەکات. پاش ئەوەی کە موسا دەساڵ شوانی تەواو کردو ئارەزۆی گەڕانەوەی ناو خزم‌و کەس‌و کاری کردو بەرەو میسر گەڕایەوە لەرێگا لە شەودا گەیشتن بە چیای "تور" جا نە ئاگریان پێ بو نە بەو شەوەش ڕێگایان دەزانی لەو کاتەدا موسا چاوی بە ئاگرێك کەوت. بۆیە بە خێزان‌و دەست‌و پێوەندەکانی وت: لێرە کەمێك بوەستن بەراستی من ئاگرێکم بەرچاو کەوت بابچم بۆ لای،

بەڵکو هیچ نەبێ دەستەوارەیەك ئاگرتان بۆ بهێنم تا خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە یان لە لای ئەو ئاگرە کەسێکم دەست کەوێت کە ڕێنمایمان بکات.

(١١) جا کاتێك کە چووە لای ئاگرەکە بانگ کراو پێی وترا ئەی موسا:

(١٢) بەبێگومان کە من پەروەردگاری تۆم پێڵاوەکانت لابە لە پێت بەراستی تۆ لە شیوی پیرۆزی "تور"دایت .

وَأَنَا ٱخۡتَرۡتُكَ فَٱسۡتَمِعۡ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِيٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدۡنِي وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكۡرِيٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخۡفِيهَا لِتُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا تَسۡعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ﴿١٦﴾ وَمَا تِلۡكَ بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُاْ عَلَيۡهَا وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخۡرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلۡقِهَا يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلۡقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٞ تَسۡعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذۡهَا وَلَا تَخَفۡۖ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضۡمُمۡ يَدَكَ إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخۡرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ مِنۡ ءَايَٰتِنَا ٱلۡكُبۡرَى ﴿٢٣﴾ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرٗا ﴿٣٥﴾ قَالَ قَدۡ أُوتِيتَ سُؤۡلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَيۡكَ مَرَّةً أُخۡرَىٰ ﴿٣٧﴾

﴿١٣﴾ خۆ من تۆم هەڵبژاردوە بۆ ئیشی خۆم، جا گوێ بگرە بۆ ئەوەی کە وحی دەکرێتە لات.

﴿١٤﴾ بزانە کە بە بێگومان منم ئەو (ﷲ)یەی کە هیچ پەرستراوێکی راستەقینەی تر بێجگە لە من نیە، دەی تۆیش بەندایەتی من بکە و تەنها من بپەرستەو بۆ یادکردنەوەی من نوێژ بکە.

﴿١٥﴾ بێگومان کە قیامەت دێت، نزیک بو بیشارمەوەو بەکەس نەڵێم تا دێت، جا هاتنی ئەو رۆژە بۆ ئەوەیە کە پاداشتی هەرکەسێك بدەمەوە بەگوێرەی ئەو ئیشانەی کە دەیکات. ئیمان بە یەکتایی پەروەردگارو بەندایەتی کردنیو باوەڕ بە پاشەرۆژ سێ بنەمای سەرەکی ئیمانی باوەڕدارە کە بێباوەڕان هەمو هەوڵێك دەدەن کە باوەڕداری لێ سارد بکەنەوەو شكو گومانی بۆ دروست بکەن.

﴿١٦﴾ جا با ئەوەی کە باوەڕی بە قیامەت نییەو دوای ئارەزۆی خۆی کەوتوە نەتوانێت کە رێگات لێ بگرێت لە باوەڕ پێهێنانوباسکردنیو خۆ ئامادەکردن بۆی، ئەگەر هاتو پەیڕەوویت کردن ئەوسا تۆیش لە ناو دەچیت هەروەك چۆن ئەوان لە ناو چوون. ئینجا خوا فەرموی:

﴿١٧﴾ ئەی موسی ئەوە چیە بە دەستی راستەوە؟ (ﷲ)ی زانا خۆی چاك دەزانێ کە چیە بەڵام لەم پرسیارە مەبەستێکی گرنگی هەیە.

﴿١٨﴾ موسایش وەڵامی دایەوەو وتی: ئەوە گۆچانەکەمەو خۆمی بەسەردا ئەدەم لە کاتی رۆیشتن داو پەلکی درەختانی پێ دەوەرێنم بۆ مەڕەکانمو هەندێ ئیشو مەبەستی ترم پێی هەیە، موسا درێژەی دا بە وەڵامەکەی چونکە جێگاکە جێگای گەیشتن بەخۆشەویستو دواندنیەتیو لەم شوێنانە دا درێژەدان بەقسە، جوانە، جا پاش ئەوەی کە ﷲ ئەم پرسیارەی لە موسا کردو موساش بەدڵنیاییەوە وتی: عەسایەو بێجگە لەو شتانەی کە خۆی دەیزانی شتێکی تری پێوە نەدیوە، ﷲ بۆ ئەوەی کە بە تەواوی دڵنیای بکات فەرمانی پێ دەکات:

ﷲ ﴿١٩﴾ فەرموی: فڕێی دە ئەی موسا.

﴿٢٠﴾ جا موساش فڕێیدا خۆ هەرکە فڕیدا، بو بە ئەژدیهایەكو بە توندی دەجوڵایەوە، تەنانەت موسا خۆی لێی ترساو پشتی تێکردو رای کرد.

﴿٢١﴾ فەرموی: عەساکەت هەڵبگرەو مەترسە ئێمە وەك ئەوەڵ جاری لێ دەکەینەوە. پاش ئەو موعجیزە، ﷲ موعجیزەیەکی تری پێ پیشان دەداتو دەفەرموێ:

﴿٢٢﴾ دەستت بخەرە ژێر باڵتەوە، بە سپی بە بێ ئەوەی کە ناشیرین بێت دێتە دەرەوە، واتە: سپیەکیوا ئەبێ کە روناکیو شەوق دەداتەوە نەك ببێ بە پەڵەو بەڵەکی کە ئەمەش بەڵگەیەکی گەورەو گرنگی ترە تا تۆ خۆت بناسیتو چاپوكو چالاکانە ئەرکی پێغەمبەرایەتیت ئەنجام بدەیت .

﴿٢٣﴾ تا ئێمە بەشێك لە نیشانە گەورەکانی تریشمان بخەینە بەرچاوت، واتە ئەمەی کەئیستا دەی بینی نیشانەگەلێکی بچوکن لەچاو ئەوەی کەلەمەولا دەیبینی. ئینجا خوا فەرموی:

﴿٢٤﴾ بچۆ بۆلای فیرعەون کە بێگومان لە سنور تێ پەڕیوەو لەگای بگاردوە، جێگای سرنج دانە موسا کاتی خۆی لە ترسی فیرعەون رایکردوەو چووەتە "مەدیەن"و چەند ساڵە لەوێیەو ئێستا ئەیەوێ سەر لەخزمانی بدات بە شێوەیەکی وا کە فیرعەون نەزانێ کە چی خوا دەیکات بە پێغەمبەرو دەفەرموێ: بچۆ بۆ لای فیرعەون؟! ئەمە دووهەم جارە کە موسا لە دەست فیرعەون رادەکات وە پەروەردگار دەیگەڕێنێتەوە بەردەست فیرعەون، کاتی منداڵی دایکی لەترسی فیرعەون فڕێدایە ناودەریاوە کەچی خوا خستیە دەستی فیرعەون، وە ئیستاش،

إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ
فِى ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّى وَعَدُوٌّ لَّهُۥ ۚ وَأَلْقَيْتُ
عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّى وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِىٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِىٓ أُخْتُكَ
فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ ۖ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَىْ تَقَرَّ
عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ ۚ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ۚ
فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾
وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِى ﴿٤١﴾ ٱذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِـَٔايَٰتِى وَلَا تَنِيَا
فِى ذِكْرِى ﴿٤٢﴾ ٱذْهَبَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوْلًا لَّيِّنًا
لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَآ إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَآ
أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَآ ۖ إِنَّنِى مَعَكُمَآ أَسْمَعُ وَأَرَىٰ
﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَآ إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ
وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَٰكَ بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىٰ مَنِ ٱتَّبَعَ
ٱلْهُدَىٰٓ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِىَ إِلَيْنَآ أَنَّ ٱلْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ
وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾ قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ
كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾

بەڵێ (ﷲ)ی زاناو کاربەجێ هەرچی ویست هەروا دەبێو هەزاران فیرعەونیش ناتوانن ڕێگای لێ بگرن، ئینجا موسا پاڕایەوە لە ﷲ،

﴿٢٥﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم دڵم فروان بکە. چونکە موسا هەست بەگەورەیی‌و سەختی کارەکەی دەکاتو دەزانێ ئەرکی بانگەواز بۆ ڕێگای ﷲ پێویستی بە خۆگریو دڵ فروانیەو موسایش زوو توڕە دەبو، بۆیە داوای کرد لە پەروەردگاری دڵی فروان بکات،

﴿٢٦﴾ جا وتی: ئەی پەروەردگارم ئەرکەکەم بۆ ئاسان بکە تا بتوانم بەباشی ڕایگەیەنم،

﴿٢٧﴾ وە ئەوگرێیەی کە بەزمانمەوەیە بیکەرەوەو قسە کردنم بۆ ئاسان بکە. دەڵێن موسا لە کاتی قسەکردندا قسەی بۆنەدەهاتو زۆر بە سەختی قسەی دەکرد لەبەر ئەوە داوای لە ﷲ کرد کە زمانی بکاتەوە بۆ قسەکردن بەشێوەیەك،

﴿٢٨﴾ تا ئەوان بە چاکی لە قسەکانم تێ بگەن.

﴿٢٩﴾ هۆ ئەی پەروەردگارم لە کەسو کاری خۆم یارمەتی دەرو وەزیرێکم بۆ دابنێ.

﴿٣٠﴾ کە ئەویش هارونی برام بێ.

﴿٣١﴾ کە بەو بەهێزم بکەو پشتم بتەو بکە.

﴿٣٢﴾ وە لەم ئەرکەم دا بیکە بە هاوبەشمو ئەویش وەك من بکە بە پێغەمبەر.

﴿٣٣﴾ بۆ ئەوەی زۆر ترو زیاتر بێ عەیبیو پاکو بێ نیازی تۆ دەربخەین.

﴿٣٤﴾ وە تا زۆرتر یادی تۆ بکەین.

﴿٣٥﴾ بەڕاستی تۆ بینەری حاڵو وەزعی ئێمەیتو چاك دەزانیت بۆچی ئەمانە لە تۆ داوا دەکەم، جا ئەی پەروەردگار ئەم داخوازیانەم لێ وەرگرە،

﴿٣٦﴾ ئەوسا پەروەدگاریش وەڵامی دایەوەو فەرموی: ئەی موسا بەڕاستی داواکاریەکانت پێی دراو ئەوەی کە دەتویست پێت بەخشرا، ئینجا نیعمەتەکانی پێشویشی دەخاتەوە بیریو دەفەرموێ:

﴿٣٧﴾ خۆ ئێمە جارێکی تریش منەتمان خستە سەر تۆ.

﴿٣٨﴾ ئەو کاتە کە وەحیمان کردە لای دایکت ئەوەی کە وەحی دەکرێ وپێمانراگەیاند کە،

﴿٣٩﴾ منداڵەکەت بخەرە ناو تابوتەوە، جا فڕەی بدەرە ناو دەریاوەو مەترسەو بە دەریاکەیشمان وت: کە لە نزیك ماڵی فیرعەونەوە بیخاتە کەنارەوە تا دوژمنێکی منو دوژمنێکی ئەو کە فیرعەون بو هەڵیگرێت، وە تۆم خۆشەویست کرد بە خۆشەویستیەکی زۆر لە دڵی فیرعەونو خێزانەکەیدا، وە تا تۆ خزمەت بکرێیت لە ژێر چاو دێری خۆم دا. بەڵێ ئەو فەرمانەی ﷲ جێ بەجێ کراو دایکی موسا لە ترسی فیرعەون ناچار تابوتێکی بۆ دروست کردو فڕەی دایە ناو ڕوباری "نیل"ـەوەو ڕوبارەکەیش لە نزیك جێگای گەشتو سەیرانی فیرعەونەوە خستیە کەنارەوەو دەستو پەیوەندانی فیرعەون هەڵیان گرتو بردیانە لای فیرعەون، ئەو فیرعەونەی کە بە هەزاران منداڵی کوشتبو تا نەك ئەو موسا بێت کە خەونی لە ناوچونی خۆی بە دەست ئەوەوە بینیوە، بەڵام (ﷲ)ی خاوەن دەسەڵاتو بەهێز هەرچی ویست وا دەبێو موسای ناردە ماڵی ئەو فیرعەونە تا خۆی بەخێوی بکاتو لەهەمو سەختیەکی ژیان ڕزگاری بکات جا خۆشەویستی کرد لەلای فیرعەونولای خێزانەکەی تا چاکترو زیاتر خەریکی ببنو بیپارێزن، وە لە ژێر چاودێریﷲ دا پەروەردە بکرێت. دیارە نەك هەر موسا بەڵکو تەواوی گیان لەباران لە ژێر چاودێری خوادان، بەڵام ئەم جۆرە چاودێریو لەگەڵ بونانە تایبەت ترن، جا خوای خاوەن دەسەڵاتو زانا زیاتر ئەو نیعمەتانەی پێشوی بۆ ڕون دەکاتەوە، چونکە موسا لەو

کاتەدا منداڵ بوەو نازانێ چۆن بوەو چی کراوە لەگەڵیاو دەفەرموێ: کاتێ کە خوشکت کە بە فەرمانی دایکت لە دورەوە تەماشای تابوتەکەی دەکردو دی کە کەوتە دەست فیرعەون‌و دەریان هێنا لە ناو تابوتەکەداو خۆشەویستی چووە ناو دڵیان، جا کۆرپەی ناوتابوت دەستی کرد بەگریان، ئەوسا ئەوانیش چون چەندین ئافرەتیان هێنا تا شیری پێ بدات بەڵکو ئاشتبێتەوە، بەڵام ئەوساوایە مەمکی هیچ کام لەوئافرەتانەی نەگرت‌و هەر دەگریا، جادەفەرموێ:

﴿٤٠﴾ ئا لەو کاتەدا خوشکت لێیان نزیك بوویەوەو گوتی: ئایا کەسێکتان پێ بناسێنم کە خزمەتی ئەو منداڵە بکات‌و شیری بداتێ؟ ئەوانیش پاش مشت‌و مڕێك لە گەڵ خوشکیا نا چاربون داوای ئەو کەسەیان کرد کە دایکی خۆی بو، جا کاتێ کە هات کتوپڕ مەمکی دایکی گرت، بەم شێوەیە ئێمە تۆمان گەڕاندەوە بۆلای دایکی خۆت لەسەر خەرجی فیرعەون، هەتا دایکیشی چاوی رۆشن ببێتەوە بە بینینی کوڕەکەی‌و تا خەفەت نەخوات، ئەمە هەندێك بو لە نیعمەتەکانی سەردەمی منداڵی، دیسان ئایا تۆ ئەی موسا لە بیرت نیەو نازانی کە تۆ کەسێکت کوشت‌و فیرعەون بڕیاری کوشتنی دایت، بەڵام ئێمە تۆمان رزگار کرد لەو غەم‌و پەژارەیە، وە ئێمە تۆمان چەند جارێك بە بەڵاو موسیبەت تاقی کردەوە، سەرئەنجام رزگارمان کردیت، وە تۆ چەند ساڵێك لە ناو ئەهلی مەدینەدا مایتەوە، لە پاشان ئەی موسا لەسەر بڕیارێکی دیاری کراوی من تۆ هاتی بۆ چیای "تور"، واتە: هاتنی تۆ شتێکی هەڵکەوت نەبوە بەڵکو ئەنجامدانی بڕیارێکی کۆنی خۆم بوەو قەدەرە.

﴿٤١﴾ من تۆم بۆ نەفسی خۆم‌و بۆ ئەنجامدانی بەرنامەی خۆم دروستکردوە کە بەرنامەکەیش بریتیە لە پێغەمبەرایەتی، جا کەوا بو هەرئێستا،

﴿٤٢﴾ تۆو براکەت بە نیشانەکانی منەوە بچن بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی من‌و لە یادی من کۆتایی نەکەن. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەرکی بانگ کەرانی راستەقینە زیاتر خەریك بونە بە یادی خواوە، نەك وەك ئەمڕۆ رۆڵەی موسڵمان هەرخەریکی شەرە پەڕۆو دیمەنجوانکردن‌و هەڵپەڕکەو تانەوتەشەر لەم‌و لەوبێ لەباتی سوڵح‌و سەفا هەر خەریکی فێڵ‌و فڕ لەم‌و لەوبێ. ئینجا خوادەفەرموێ:

﴿٤٣﴾ برۆن بۆ لای فیرعەون بێگومان فیرعەون ملهوڕانە لە خراپەو تاواندا لەسنور تێی پەڕاندوە.

﴿٤٤﴾ قسەی لەگەڵا بکەن بە قسەیەکی نەرم بەڵکو بیر بکاتەوەو لەو تاوان‌و ملهوڕیە واز بهێنێ یان لە سزای ئێمە بترسێت. ئەمە فەرمانی کەسێك نیە کە نەزانێت کە ئایا فیرعەون لە ئەنجامدا باوەڕ دەهێنێ یان نە، بەڵکو فەرمانی ئەو زاتەیە کە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی کە ئاسمان‌و زەوی دروست بکات ئەندازەگیری هەمو شتێکی لە "لەوحولمەحفوز"دا تۆمارکردوەو چاك زانویەتی کە فیرعەون باوەڕ ناهێنێت، بەڵام ئەو زاتە بە نێرراوانی خۆی فەرمان دەدات کە بە چاك ترین شێوە ئەو پەیامە راگەیەنن، لە راستی دا ئەمە باشترین وانەیە بۆ ئەوانەی کە دەعوە دەکەن بۆ رێگای ﷲ دەبێ زۆر بە دڵسۆزیەوە پەیامی ﷲ بەهەمو کەس بگەیەنن با دوژمنێکی زۆر سەر سەخت بێت وەك فیرعەون.

﴿٤٥﴾ جا موساو هارون وتیان: ئەی پەروەردگارمان بە راستی ئێمە دەترسین کە ئەو پێش ئەوەی کە ئێمە ئەم پەیامەی پێ راگەیەنین دەست درێژی بکاتە سەرمان‌و بمان کوژێت یان ئەگەر قسەی لەگەڵدا بکەین لە سنور تێ پەڕێت‌و خراپتر ببێت،

﴿٤٦﴾ خوای بە هێزو زانا وەڵامی دانەوەو فەرموی: مەترسن من لە گەڵتاندام‌و یارمەتیتان دەدەم‌و قسەی هەمو لایەك دەبیستم‌و چاوم لێتانەو دەتان پارێزم.

﴿٤٧﴾ جا ئێوە بچنە لای‌و بڵێن کە ئێمە نێرراوی پەروەدگارتین، جا تۆش بەنی ئیسرائیلی کە کرد وتن بە بەندەی خۆت وازیان لێ بهێنە با لەگەڵ ئێمەدا بن‌و سزایان مەدە، بەراستی ئێمە بە نیشانەیەکی گەورەی پەروەردگارت هاتوینە لات ئەوسا ئەو کەسەی کە پەیڕەوی لە رێنمای ﷲ بکات لە سزای پەرەوەردگار لە ئەمان دایە، ئینجا ئەو دوو پێغەمبەرە بەرێزە بەم شێوەی کەﷲ فەرمانی پێکردن چونە لای فیرعەون‌و وتیان:

﴿٤٨﴾ بێگومان ئێمە وەحیمان کراوەتەلا کە سزای سەختیﷲ بۆ ئەو کەسەیە کە پێغەمبەران بە درۆ بخاتەوەو پشتیان تێ بکات‌و گوێ بەفەرمانی ﷲ نەدات.

﴿٤٩﴾ جا فیرعەون هاتە قسەو وتی: ئەی موسا پەروەردگارتان کێ یە؟

﴿٥٠﴾ موسایش وتی: پەروەردگاری ئێمە ئەو زاتەیە کە هەمو بونەوەری دروستکردوەو بە هەمو شتێك ئەو شێوەو هەیکەلەی کە شایستەیەتی پێی بەخشیوە، وە تێی گەیاندوە کە چۆن بۆمانی خۆی هەوڵ بدات کە ئەوەی سودی تێدایە بۆی بەدەستی بهێنێ‌و ئەوەیش کە زیانی تێدایە خۆی لێ بپارێزێ، وە چۆن لەگەڵ یەکدا بژین‌و زاوزێ بکەن، جا هەریەکەی بە شێوەی گونجاو لەگەڵ سەرو سیمای جوان‌و رێك‌و پێکی خۆیدا خەریکی

قَالَ عِلۡمُهَا عِندَ رَبِّي فِي كِتَٰبٖۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّي وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ مَهۡدٗا وَسَلَكَ لَكُمۡ فِيهَا سُبُلٗا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَخۡرَجۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّن نَّبَاتٖ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُواْ وَٱرۡعَوۡاْ أَنۡعَٰمَكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ﴿٥٥﴾ وَلَقَدۡ أَرَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾ قَالَ أَجِئۡتَنَا لِتُخۡرِجَنَا مِنۡ أَرۡضِنَا بِسِحۡرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأۡتِيَنَّكَ بِسِحۡرٖ مِّثۡلِهِۦ فَٱجۡعَلۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكَ مَوۡعِدٗا لَّا نُخۡلِفُهُۥ نَحۡنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانٗا سُوٗى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوۡعِدُكُمۡ يَوۡمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحۡشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحٗى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرۡعَوۡنُ فَجَمَعَ كَيۡدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيۡلَكُمۡ لَا تَفۡتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖۖ وَقَدۡ خَابَ مَنِ ٱفۡتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّجۡوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخۡرِجَاكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِمَا وَيَذۡهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلۡمُثۡلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجۡمِعُواْ كَيۡدَكُمۡ ثُمَّ ٱئۡتُواْ صَفّٗاۚ وَقَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡيَوۡمَ مَنِ ٱسۡتَعۡلَىٰ ﴿٦٤﴾

خۆ بەخێو کردنو جوانکردنی ئەم ژینگەیەنو هیچیان لە سنوری دیاری کراوی خۆیان لەم ژیانەدا تێناپەڕن، بێجگە لە بەشێکی زۆر لە ئینسانو جنۆکە، وە بەهەشتو دۆزەخیش بۆ ئەو دوو جۆرە دانراوە،

(٥١) جا فیرعەون پاش بیستنی ئەم وەڵامە جوانو تەواوەی موسا، وتی: ئەگەر وایە ئەی حاڵی ئەوگەلانەی پێشو چۆنە کە باوەڕیان نەبوە بە خوای تۆ؟ وە بێجگە لەویان پەرستوە؟

(٥٢) موسا وتی: زانینی حاڵی ئەوانە کە چییان کردوەو سەر ئەنجامیان چۆن بوە لە کتێبێك دایە کە لە لای پەروەردگارمە، واتە: هەموی لە"لەوحولمەحفوز"دا تۆمار کراوە، پەروەردگاری من هیچی لێ ون نابێتو هیچی لە بیر ناچێتەوە، جا ئەوانیش بەم زوانە بەپێی ئەو نوسراوە پاداشتو تۆڵەی خۆیان وەردەگرن، وە ئەمە ئیشی ئێمە نیە کە قسەی لە سەر بکەین، بەڵکو ئەوە لە عیلمو زانیاری زاتی اللّٰه دایە .

(٥٣) ئەو زاتەی کە زەوی وەك بێشکەیەك لێ کردوە بۆتان، وە چەندین ڕێگەی بۆ ئێوە دروستکردوە لەو زەوییەدا کە بتوانن بەئاسانی هاتو چۆی تێدا بکەن، وە لە ئاسمانەوە ئاو دەنێرێتە خوارەوە بۆتان، جا خوا دەفەرموێ: بەو ئاوە هەمو جۆرە گژو گیایەك دەردەهێنینو سەوزی دەکەین،

(٥٤) دەی خۆتان بیخۆن و مەڕو ماڵاتەکانتانی تێدا بلەوەڕێنن، بێشك ئا لەمە دا چەندین بەڵگە هەیە لەسەر دەسەڵاتو تەنیایی اللّٰه بۆ ئەوانەی کە خاوەن عەقڵن، ئینجا اللّٰه دەفەرموێ:

(٥٥) ئێمە ئێوەمان لەم خاکە دروستکردوە، وە بۆ ناو ئەویش دەتانگێڕینەوەو دەتان مرێنینو لەم خاکەوە جارێکی تر بۆ حەشرو حیساب دەرتان دەهێنینەوە بە زیندوکراوی.

(٥٦) جا بەحەقیقەت ئێمە هەمو نیشانەکانی خۆمانمان پیشانی فیرعەون دا، کەچی ئەو بێباوەڕبو بە موساو بەدرۆی خستەوەو ئامادە نەبو کە دان بەو حەقیقەتو ڕاستیەدا بنێت.

(٥٧) وتی: ئەی موسا ئایا تۆ هاتویت بۆلای ئێمەو دەتەوێ لەم زەوییەی خۆماندا بە جادوەکەت دەرمان بکەیت؟ ئەمە دووهەم پرسیاری فیرعەونە لە موسا، لە پرسیار یەکەم دا هەوڵ دەدات کە پرسیارەکەی بە جۆرێك بێت کە موسا بە خراپە باسی باوو باپیرانی پێشو بکاتو بەو شێوەیە لە خۆشەویستی خەڵك بۆ نەتەوایەتی کەڵك وەربگرێت تا ڕقو قینی خەڵك بەرامبەر بە موسا هەڵگرسێنێت، بەڵام موسا زۆر بە جوانی بە جۆرێك وەڵامی دایەوە کە فیرعەون ئامانجەکەی نەپێکێت، وە لە پرسیاری دووهەم دا هەر بەو مەبەستە باس لەوڵاتو نیشتمان دەکات، جاموسا وا دەناسێنێت کە دەیەوێت پشت بە سیحرەکانی ئەو خەڵکە لەو لاتی خۆیان دا دەربەدەر بکات، کە ئەمە دابو نەریتی فیرعەونەکان بوە لە هەمو زەمانێك دا، ئەوسا فیرعەون هەمو موعجیزەکانی بە سیحر داناو وتی: ئەمانە شتێکی گرنگ نین،

(٥٨) جا بەراستی ئێمەش لە بەرامبەر دا سیحرێك لەوێنەی ئەو سیحرەی تۆ دەهێنینو دەیدەین بە گژیدا، جا ئادەی لە نێوان ئێمەو خۆتدا کاتێکی بۆ دیاری بکە کە هیچ کامنان پێچەوانەی ئەوکاتە نەجوڵێینەوە، نەئێمەو نە تۆیش، لە شوێنێکی ڕێكو پێكو دەشتدا کە هەمو کەس بمان بینێ.

(٥٩) موسایش وتی کاتی دیاریتان با ڕۆژی (زینەت) بێ، وە با خەڵك لەکاتی چێشتەنگاودا لەوێ ئامادەبکرێنو کۆبکرێنەوە. لەوە دەچێ‌کە ڕۆژی زینەت ڕۆژێکی زانرا بوە لای هەمویان.

(٦٠) جا فیرعەون پشتی هەڵکردو دانیشتنەکە دوای هاتو فیرعەون ئەوەی کە پێی دەکرا بۆ دژایەتی موسا لە فرۆفێڵ کۆی کردەوەو پیاوی بەوڵاتدا ناردو هەمو جادوکەرانی چالاکی کۆکردەوە بۆ ئەوەی لە ڕۆژی دیاری کراو دا دژ بە موسا بوەستن، پاشان کاتی دیاری کراو هاتو فیرعەونو دەستو دایەرەی لەگەڵ سەدان جادوگەردا، وە بە هەزاران خەڵکی تر ئامادەی کۆبونەوەکە بوونو فیرعەون لەسەر تەختی خۆی دانیشت، موساش کە خۆی

ئەدا بەسەر عەساکەیدا لەگەڵ هارونی برای دا بەرەو کۆڕەکە هاتنو کاتێ کە گەیشتنە ناو خەڵکەکە، چووەلای جادوگەرەکانو ئامۆژگاری کردن.

(٦١) موسا پێی وتن: هاوار بۆ ئێوە نەکەن درۆ بەدەمی (اللَّهِ)وە بکەن، ئەگەر واتان کرد ئەوسا بەراستی خوای باڵا دەست بە سزایەکی گەورە تۆڵەتان لێ وەردەگرێتو لەناوتان دەبات، وە بەراستی رەنجەڕۆیە ئەوکەسەی کە درۆ دەکات بەدەم (اللَّهِ)وە، بەڵێ ئەم ئامۆژگارییەی موسا کاری خۆی کردو جادوگەرانی هەژاند.

(٦٢) ئەوسا جادوگەرەکان لە نێوان خۆیاندا بو بەکێشەیان، وە بە نهێنی قسەیان لە نێوان خۆیاندا دەکرد، هەندێکیان قسەیان لە راستی موساو پەیامەکەی دەکرد، بەڵام لە بەر زۆری نەیارانو ترس لە فیرعەون قسەیان کرد بە یەك.

(٦٣) وتیان: بێگومان ئەمانە دوو جادو گەرن کە دەیانەوێ بەو سیحرەیان ئێوە لەسەر ئەم خاکەی خۆتان دەربکەنو ئەو رێگاو رەوشتە بەنرخەتان لە ناوببەن .

(٦٤) جا کەوابو پێویستە هەمو فرو فێڵتان بخەنەکارو یەك قسەبن لە پاشان هەموتان بەیەك ریز بێنە پێشەوە، وە بەراستی رزگارە ئەو کەسەی کە ئەمرۆ سەربکەوێت،

(٦٥) ساحیران بە موسایان وت: ئەی موسا یان تۆ عەسای خۆت فڕە بدە یان ئێمە یەکەم کەس بین کە ئیشی خۆمان بکەینو شتی خۆمان فڕێ بدەین.

(٦٦) موسا فەرموی: نەخێر ئێوە ئیشی خۆتان بکەنو شتی خۆتان هەرچی هەیە فڕەبدەن، جا ئەوانیش سیحری خۆیان کرد هەرچی پەتو عەسایان پێ بو فڕەیان داو لە بەر گەورەو گرنگی سیحرەکەیان موسا وا دەکەوتە بەرچاوی‌و وای بۆ دەچوکە ئەوانە بوون بە مار گەلێك کە بەپەلە جموجوڵ دەکەن، ئەو هەمو پەتو عەسایە لە بەرچاوی موسادا بوون بە مارو دەجوڵانو موسا کە بێ باکی‌و بێ نیازی اللَّهِ شارەزا بو دەترسا لەوکاتەدا وەڵام نەدرێتەوە.

(٦٧) لەبەر ئەوە موسا ترسێك چوە ناو دڵیەوە. چونکە باوەڕدار لە مەکری اللَّهِ دەترسێت، بەڵام ئەو زاتە میهرەبانو تواناو زانایە خۆشەویستانی خۆی لەبیر ناباتەوەو لە کاتی تەنگانەدا دێت بەهاواریانەوە ئەوەتە لەم کاتەدا اللَّهِ بانگی لە موسا کردو دڵنیای کرد کە ئەمرۆ ئەو لەم بەربەرەکانیەدا سەرکەوتو دەبێ وەك دەفەرموێ:

قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلْقِىَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَىٰ (٦٥) قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ (٦٦) فَأَوْجَسَ فِى نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ (٦٧) قُلْنَا لَا تَخَفْ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْأَعْلَىٰ (٦٨) وَأَلْقِ مَا فِى يَمِينِكَ تَلْقَفْ مَا صَنَعُوٓا۟ ۖ إِنَّمَا صَنَعُوا۟ كَيْدُ سَـٰحِرٍ ۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ (٦٩) فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَـٰرُونَ وَمُوسَىٰ (٧٠) قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ ۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَـٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِى جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ (٧١) قَالُوا۟ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَـٰتِ وَٱلَّذِى فَطَرَنَا ۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍ ۖ إِنَّمَا تَقْضِى هَـٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ (٧٢) إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَـٰيَـٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِ ۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ (٧٣) إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ (٧٤) وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ عَمِلَ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَـٰتُ ٱلْعُلَىٰ (٧٥) جَنَّـٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ (٧٦)

(٦٨) وتمان: ئەی موسا مەترسە بە بێگومان ئەمڕۆ تۆ سەرکەوتو دەبی.

(٦٩) جا ئەوەی کەبە دەستی راستتەوەیە فڕەیدە هەرچیان کردوە قوتی دەدا، چونکە ئەوەی کە ئەوان کردویانە فڕوفێڵی جادوگەرانە، بەڵام هی تۆ موعجیزەی پێغەمبەرە. دڵنیابە کە بەراستی ساحیر سەر ناکەوێت هەرچی بکاتو لە هەرکوێوە بێت. بەڵێ موسا فەرمانی خوای بەجێ هێناو عەساکەی فڕەداو هەمو پەتو عەسای بە ماربوی ساحیرانی قوت دا تەنانەت موسا لە عەساکەی خۆی ترسا تااللَّهِ فەرموی: عەساکەت هەڵگرە، ئیتر موسا دەستی بۆ عەساکەی بردو هەڵیگرت دی هەر عەساکەی خۆیەتی‌و لەگەڵ قوتدانی ئەو هەمو پەتو عەسانەدا هیچ گۆڕانکارییەکی بەسەردا نەهاتوە، ئیتر هەرللَّهِ خۆی دەزانێ پەتو عەساکانی ئەوان چییان لێ هاتو بۆ کوێ چون، جا ساحیرەکان کاتێ کە ئەمەیان دی بەچاکی زانیان کە ئەمە سیحر نییە .

(٧٠) جا هەمو ساحیران سوجدەیان برد بۆ (اللَّهِ)و وتیان: و ا باوەڕمان هێناوە بە پەروەردگاری هارونو موسا،

(٧١) جا کە باوەڕیان هێنا فیرعەون دەستی کرد بە هەڕەشە کردن لێیان، وتی: ئێوە باوەڕتان پێکردوە پێش ئەوەی کە من ئیزنتان بدەم، بێگومان دەرکەوت کە ئەو گەورەتان بوەو وانەی سیحری

وَلَقَدۡ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَسۡرِ بِعِبَادِي فَٱضۡرِبۡ لَهُمۡ طَرِيقٗا فِي ٱلۡبَحۡرِ يَبَسٗا لَّا تَخَٰفُ دَرَكٗا وَلَا تَخۡشَىٰ (٧٧) فَأَتۡبَعَهُمۡ فِرۡعَوۡنُ بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلۡيَمِّ مَا غَشِيَهُمۡ (٧٨) وَأَضَلَّ فِرۡعَوۡنُ قَوۡمَهُۥ وَمَا هَدَىٰ (٧٩) يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ قَدۡ أَنجَيۡنَٰكُم مِّنۡ عَدُوِّكُمۡ وَوَٰعَدۡنَٰكُمۡ جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنَ وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَنَّ وَٱلسَّلۡوَىٰ (٨٠) كُلُواْ مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقۡنَٰكُمۡ وَلَا تَطۡغَوۡاْ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبِيۖ وَمَن يَحۡلِلۡ عَلَيۡهِ غَضَبِي فَقَدۡ هَوَىٰ (٨١) وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ (٨٢) ۞ وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ (٨٣) قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ (٨٤) قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ (٨٥) فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي (٨٦) قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ (٨٧)

فێرکردون، بۆیە نەتان توانی بەرامبەری بوەستن‌و خۆتان داوە بە دەستەوە، جا با چاك بزانن من دەست‌و لاقتان بە پێچەوانەی یەکتر دەبڕم‌و هەڵتان دەبەسم بە دارخورماداو لەمەولابە چاکی بۆتان دەرئەکەوێت کام لە ئێمە سزای زۆر بەهێز ترو درێژ خایەن ترە، فیرعەون کاتێك دەبینێت ساحیرەکان باوەڕیان هێناوە نالێت ئەوە بۆ باوەڕتان بە موسا هێنا، بەڵکو دەڵێت:جۆن پێش ئەوەی کە من ئیزنتان پێبدەم ئیمانتان هێناوە دەیەوێت بەم شێوەیە ئیمان هێنانی ئەم ساحیرانە کە لەپێشدا پشتی بەوانە بەستبو بە بێ‌نرخ دا بنێت واتە دەڵێت: گرنگ نیە کە ئێوە ئیمانتان هێناوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە بە بێ ئیزنی من ئەم ئیشتان کردوە، وە ئەمەیش نەریتی فرعەونیانە لە هەموکاتێك دا هەوڵ دەدەن سەرکەوتن‌و زاڵبونی بەڵگەی ئەهلی ئیمان بێ نرخ پیشان بدەن‌و بە تۆقین‌و هەڕەشە مەبەستی خۆیان بسەلمێنن، فیرعەون هەڕەشە لە ساحیرەکان دەکات، بەڵام ئەو ساحیرانە لەو ماوە زۆر کەمەدا نوری ئیمان کەوتە دڵیانەوەو تامو لەزەتێکی وایان لەو ئیمانە کرد کە گوێیان بە هەڕەشەی فیرعەون نەدا، بەڵێ ئیمان ئاگرێك لە ناو دڵدا هەڵدەگرسێنێت کە مرۆڤ فیداکارو چاو نەترس دەکات.

(٧٢) وتیان: سوێند بەو کەسەی دروستی کردوین هەرگیز پەیڕەوی لەتۆ ناکەین‌و تۆ هەڵنابژێرین بە سەر ئەو بەڵگە رون‌و ئاشکرانەی کە هاتوەتە لامان کە راستی موساو پوچی تۆیان دەرخست، جا تۆ چیت پێ‌دەکرێت بیکەو بێ منەت بە، ئێمە رێگەی راستمان پەیدا کردوەو بەدڵ‌و بەگیان وەرمان گرتوە. ئەوەی کە تۆ پێت دەکرێت تەنها لەم ژیانەی دنیادایەو بەس.

(٧٣) بێگومان ئێمە ئیمانمان هێناوە بە پەروەردگاری خۆمان تا لە گوناهەکانمان خۆش ببێت‌و لەتاوانی ئەو سیحرەیش کە تۆ ئێمەت ناچار کردوە کە بیکەین، وە پاداشتی ﷲ بۆ ئەو کەسەی گوێڕایەڵی دەکات زۆر چاك ترو درێژخایەن ترەو تەنها پەیرەوی ئەو زاتە چاکەو هەر ئەویشە کە بۆ ئێمە دەمێنێتەوە نەتۆ، ئینجا دەستیان کرد بە بانگەواز بۆ ئەو ئاینە پیرۆزەی کە تا چەند کاتژمێرێك لەوەو پێش هیچیان لێ نەدەزانی، جا وتیان:

(٧٤) بێگومان راستی ئەوەیە کە هەرکەسێك بەتاوانباری بگەڕێتەوە پێشگای پەروەردگاری‌و پێش مردنی لەو کوفرو شیرکە پەشیمان نەبوبێتەوە، ئەوسا بێگومان ئەوکەسە ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە نە دەمرێت تێیدا تا رزگاری ببێت‌و نە ژیانێکی خۆش‌و بێ دەردەسەر دەداتە سەر. بەڵکو بڕیاری مانیان لە ژیانێکی پڕ ئیش‌و ئازاری هەتاهەتایدا بۆ بڕاوەتەوە.

(٧٥) وە هەرکەس بە ئیمانەوە بگاتە دادگای ﷲ لە رۆژی قیامەت داو بە ئیمانەوە بمرێت‌و لە دنیادا کردەوەی چاکی کردبێت، ئەوسا ئەوانە چەندین پلەی بەرزیان بۆ هەیە.

(٧٦) کە جێگای کەیف‌و خۆشی‌و دانیشتنیان باخاتێکە کە لەژێر ئەو باخاتانەدا چەندین جۆگا دەڕوات، کە لە ناویدا بۆ هەمیشە دەمێننەوەو هەرگیز نامرن‌و دەرناکرێن. وە ئەوە پاداشتی ئەوکەسەیە کە خۆی پاك دەکاتەوە لە خراپەو خراپەکاری‌و تاوان. بەم شێوەیە ئاینی موسا ئاشکراترو بەهێزتر بوو خەڵکی ئەو دەوروبەرە هەموی پێی زانی‌و پوچی فیرعەون دەرکەوت، بەڵام تاغوتان تا جوڵەیان تێدایە لە کەللەڕەقی‌و تاوانکاری واز ناهێنن ئەوە بو فیرعەون فەرمانی شەهید کردنی ئەو باوەڕدارانەی دا کە چەند کاتژمێرێك لەوەو پێش خۆی بەوان بەرز دەکردەوە، جا بارودۆخ بەتەواوی گۆڕاو فیرعەون بڕیاری کوشتنی موسای دا، بەڵام پەروەردگار موسای ئاگادارکردەوەو فەرموی:

(٧٧) بەراستی ئێمە وەحیمان کردە لای موساو وتمان: کە شەو خۆت‌و هەمو بەندە باوەڕدارەکانم ببە لەگەڵ خۆتاو لە میسر دەربچن، ئەوە بو موسا شەو لەگەڵ پەیڕەوانیدا لە وڵاتی میسر دەرچون، ئینجا فیرعەونیش بەو سوپایەی کە کۆی کرد بویەوە دوایان کەوتن، لە کاتی هەڵهاتنی رۆژدا لەسەر روباری نیل فیرعەون گەیشتە نزیکیان کاتێ زیاتر نزیك بونەوە خوای

بەهێزو بالأدەست فەرموی: دەی موسا عەساکەت بدە لەو بەحرە ئەو ئاوە لەت دەبێو زەوییەکەش وشك دەبێتەوە، جا ئێوەش لێی بدەنو باکت لەگەیشتن بە فیرعەونو ترست لە خنکانیش لە ناو ئەو دەریایەدا نەبێت، بەڵێ موسا عەساکەی لەو دەریایەداو بو بە دوانزە بەشەوەوە زەویەکەیشی وا وشك بویەوە کە هیچ قوڕی نەما، فیرعەون کاتێ هاتو ئەو روبارەی بەو شێوەیە دیو تی: ئەوە لەترسی من لەت بوە؛

﴿٧٨﴾ جا فیرعەونیش بەخۆیو سەربازەکانیەوە بەشوێنیاندا چوون، جا ئاوی ئەو روبارە دایپۆشین چۆن دایپۆشینێ، شەپۆل لە سەر شەپۆل، بەراستی سەوتو ئاوازی وشەکان جۆشو خرۆشی شەپۆلانێك دەگەیەنن کە یەك لە دوای یەك فیرعەونو سوپاکەی دادەپۆشی. بەڵێ فیرعەون وا بەو جموجوڵەی، خۆی گەیاندە شوێنی مردنیو کۆتای بەتەمەنی نەگریسی هاتو موساو پەیڕەوانی لە شەڕی ئەو تاغوتە رزگاریان بو، ئینجا خوای خاوەن دەسەڵاتو هەمیشە زیندو دەفەرموێ:

﴿٧٩﴾ فیرعەون گەلەکەی خۆی گومرا کرد، وە بۆ هیچ کارێکی چاك رێنمای نەکردنو هیچ چاکەیەکی نەبوە بۆ گەلەکەی. بەڵکو لە گەڵ خۆیدا بردنی بۆناو سزای پەروەردگار.

﴿٨٠﴾ جا ئێوەش ئەی بەنی ئیسرائیلییەکان سپڵەو بێ نمەك مەبنو تەماشا بکەنو بزانن کە ئێمە چۆن ئێوەمان لەشەڕی ئەو دوژمنە ستەمکارە رزگار کرد. وە ئێمە لەتەنشتی راستی چیای "تور" موە بەڵێنمان پێدان بۆوەرگرتنی پەیامی ﷲ و گەزۆو شیلاقەمان پێدان، واتە: شیرینیەکی فرەوانو گۆشتی زۆری باڵندەمان پێدان.

﴿٨١﴾ دەی بخۆن لەوانەی کە پاكو خاوێننو ئێمە داومانن پێتان، وە لە خواردنی ئەو نیعمەتانەدا لەسنوری خۆی تێ مەپەڕنو لە خۆ بای مەبن، چونکە ئەگەر وابکەن رقی من دەتان گرێتەوەو هەرکەسێکیش رقی من بیگرێتەوە بەراستی ئەو کەسە لە ناو چوو فەوتاوە.

﴿٨٢﴾ خۆ بێگومان من زۆر لێبوردەم بۆ ئەوکەسەی کە پەشیمان بێت لەهەڵەکانیو باوەڕی هێنابێتو ئیشی چاکی کردبێت، لەپاشان رێگەی راستی گرتبێتو وازی لە رێچکەو رێبازەکان هێنابێت. جا موسا حەفتا کەسی لە گەلەکەی هەڵبژاردو بەرەو چیای تور کەوتنە رێ بەڵام موسا لەبەر ئەو خۆشەویستییە زۆرەی کەهەیبو بەرانبەر بە پەروەردگاری پەلەی کردو کەمێ پێش ئەوان گەیشتە چیای تور، جا ﷲ فەرموی:

﴿٨٣﴾ ئەوە چ شتێك وای لێ کردی کە پەلە بکەیتو گەلەکەت بەجێ بهێڵی؟

﴿٨٤﴾ موسا لەوەڵامی ئەم پرسیارەی (ﷲ)دا وتی: ئەوان وا بەدوای من دا دێنو من بۆیە پەلەم کرد تا تۆ لێم رازی بی. بەڵام ﷲ هەواڵێکی بە موسای گەیاند کە لێی بێ ئاگابو،

﴿٨٥﴾ فەرموی: ئەی موسا بەراستی ئێمە گەلەکەتمان تاقی کردەوە لەپاش تۆو سامیری بەهۆی دروستکردنی گوێرەکەیەکەوە لە رێی ترازاندنو سەری لێ تێکدان، ئینجا پەروەردگار ئەو سەفەرەی موسا کە سی رۆژ بو کردی بە چل رۆژ، جا ئەمە بو بە هۆی ئەوەی کە سامیری بتوانێت زیاتر پڕوپاگەندە دژی موسا بڵاو بکاتەوە، ئەم کارە دەستکردەی خۆی بە خوا پیشانی ئەو گەلە بداتو زیاتر سەریان لێ تێك داتو بیانکات بە بت پەرست.

﴿٨٦﴾ ئینجا موسا پاش ئەوەی چەند لەوحێکی لە فەرمانی پەروەردگار بۆ هات گەڕایەوە بۆ ناو گەلەکەیو زۆر بە تورەیو رقەوە لە حاڵێکدا زۆر غەمگینو بە پەژارە بو لەو کارەساتە، موسا وتی: ئەی گەلی من ئایا پەروەردگارتان بەڵێنە جوانەکەی سەرکەوتنی دنیاو بەهەشتی پاشە رۆژی پێ نەدا بون؟ ئایا ئەو بەڵێنو وەعدانە زەمانێکی زۆری بەسەردا هاتوە کە لەبیرتان چوبێتەوە؟ یان هەر ویستتان رقو قینی پەروەردگارتان بتان گرێتەوە؟ جا ئێوەش بە پێچەوانەی ئەو بەڵێنەی کە داتان بە من جوڵانەوە، جا نە چاوەڕانی گەڕانەوەی منتان کردو نەبە گوێی هارون؟

﴿٨٧﴾ ئەوسائەوانیش وەڵامی موسایان دایەوەو هۆی گومڕابونی خۆیانیان بۆ باسکردو وتیان: ئەی موسا بەراستی ئێمە بەدەستی خۆمان نەبوە کە دژایەتی قسەی تۆمان کردوە، بەڵکو روداوەکە ئاوا بوو کە ئێمە زێڕو زیوێکی ئەوگەلە فەوتاوەمان پێ هەڵگیرابو لە پاشان فڕەماندا، وە هەروەها سامریش لە کوڵی خۆی کردەوە. جا سامیریش لەو زێڕو زیوە لەشی گوێرەکەیەکی بۆ دروستکردن کە دەنگی لێوە دەهات.

﴿٨٨﴾ جا ئەوکاتە سامیریو شوێنکەوتوانی وتیان: ئەمەیە خوای ئێوەو خوای موسا، بەڵام موسا رێگەی لێ هەڵەبووەو لە بیری چوەتەوە کە ئەو لێرەیەو ئیستاش بەشوێنی دا دەگەڕێت، بۆیە تا ئیستا نەگەڕاوەتەوە، جا خوا سەرزەنشتیان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٨٩﴾ ئایا ئەوان نابینن کە ئەو ناتوانێ وەڵامیان بداتەوەو قسەیان لەگەڵ دا بکات، وەخاوەنی هیچ زیانو سودێك نیە بۆیان؟ واتە: ئەگەر کەمێ ژیری بخەنەکارەوە دەزانن کە ئەمە لە هەیکەلێك زیاترشتێکی تر نیەو شایانی پەرستن نیە چ جای خوایەتی.

فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾ وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي ﴿٩٠﴾ قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرۡتُ بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ عَاكِفٗاۖ لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِي ٱلۡيَمِّ نَسۡفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَسِعَ كُلَّ شَيۡءٍ عِلۡمٗا ﴿٩٨﴾

﴿٩٠﴾ جا بەحەقیقەت هارونیش پێش ئەوەی موسا بگەڕێتەوە پێی وتن: ئەی گەلی من بەراستی ئێوە بێجگە لەوەی کەبەم هەیکەلە تاقی کرانەتەوە شتێکی تر نیەو بە راستی پەروەردگاری ئێوە ئەو زاتە بەڕەحمو بەخشندەیە کە ئەو هەمو ڕەحمو بەزەیەی بە ئێوە کردوەو لەو دوژمنە سەرسەختە رزگاری کردن، دەی بە گوێم بکەنو دوام کەونو واز لەو گوێرەکە پەرستیە بهێننو فەرمانی من جێ بەجێ بکەن، ئەوەیە ئەرکو پێویستی سەرشانتان. بەڵام ئەوان بەگوێی هارونیان نەکرد.

﴿٩١﴾ وتیان: ئێمە وازی لێ ناهێنین هەتا موسا نەگەڕێتەوە ناومان.

﴿٩٢﴾ جا موسا پاش لۆمەو سەرزەنشتی گەلەکەی روی لە هارونی برای کردو وتی: ئەی هارون چ شتێك رێگای لە تۆ گرت کە شەڕیان لەگەڵدا بکەیت کاتێك کەدیت ئەوان سەرلێشێواوگومڕا بوونو دەستیان بە گوێرەکە پەرستی کردوە؟

﴿٩٣﴾ ئایا تۆ گوێرایەڵو تابیعی من نەبویت؟ ئایا تۆ فەرمانی منت شکاندوە؟ ئەگەر وانیە چۆن بێدەنگ بویتو لە ناویان دا دانیشتی لە حاڵێکدا کەئەوان رویان لە شیركو کوفر کرد. بەڵێ موسا کاتێك کەویستی بڕوات بۆ کێوی تور هارونی کردبو بە جێنشینی خۆی لە ناو گەلەکەیدا تا دەگەڕێتەوەو بەگەلەکەیشی سپاردبو کە پەیڕەوی بکەنو بە هارونیشی وتبو: کە بەرژەوەندی گەلەکەی بپارێزیو پەیڕەوی خراپەکاران نەکات، بەڵام وائێستا ئەو گەلە تێکچوە، جا موسا بەو شێوەیە دەستی کرد بە سەرزەنشتی هارونو بەدەستی راستی سەری گرتو بە دەستی چەپی ریشی گرت.

﴿٩٤﴾ هارون وتی: ئەی کوڕی دایکم نەسەرم بگرەو نەڕیشمو لۆمەو سەرزەنشتم مەکە، وەلە بەرچاوی ناحەزانو دوژمناندا مەمشکێنە بەراستی من ترسام ئەگەر خۆم بێ تۆ شتێکیان لەگەڵ بکەمو لەگەڵ چاکەکانیاندا دژی خراپەکانیان بوەستمایە تۆ لە پاشدا پێم بڵێیت بۆ دووبەرەکیت لە نێوان بەنی ئیسرائیلیدا دروستکردوەو چاوەڕوانی منت نەکردوە تا دەگەڕێمەوە ئا لەبەر ئەوە بو کە من لەوان بێدەنگ بووم.

﴿٩٥﴾ جا موسا قسەکانی هارونی بەراست زانیو روی کردە کابرای گوێرەکە دروستکەرو وتی: ئەی سامیری ئائەم ئیشە گەورەیە چیەو بۆچی ئەم هەڵە گەورەت کردوە؟ بەڵێ موسا تا لێکۆڵینەوەی تەواوی نەکرد هیچ بڕیارێکی نەدا، سامیری لە وەڵامی موسادا ،

﴿٩٦﴾ وتی: من شتێکم چاو پێ کەوت کە ئەوان نەیان دیت کە بریتی بو لە جوبرەئیل کاتێ هاتە لای موسا، جا وتی: من مشتێك خاکم هەڵگرت لە ژێر پێی نێرراوەکەی (ﷲ)دا کە (جبرئیل) بو وەئەو خاکەم خستە ناوی ئەو هەیکەلەوەو ئەو دەنگەی لێ هات، وە هەر ئاوا نەفسم ئەو ئیشەی بۆ جوان کردمو ئەنجامم دا، ئینجا موسا پاش بیستنی قسەی هەمویان بڕیاری دا.

﴿٩٧﴾ جا بە گوێرەکە دروستکەرەکە کە (سامیری) بو وت: بڕۆ بەراستی تۆ ئەبێ لەم ژیانەدا نەخۆشیەکی وات توش ببێ کە هەمیشە بڵێیت : نابێت کەس دەستم لێ بداتو نزیکم ببێتەوە، واتە: ﷲ دوچاری نەخۆشییەکی کرد کە تا دەستی لێ بدرایە ژانی زیاتر دەبو، وە بێگومان بۆ تۆ کاتێکی دیاری کراو هەیە بۆ مردنت کە ناتوانیت لەو کاتە تێپەڕیت، ئینجا زیاتر سزای رۆحی ئەدەیتو ئەڵێ تەماشای ئەو خوایەت بکە کە تۆ ماوەیەکبو خۆتت بەستبویەوە بۆیو بەندایەتیت ئەکرد بەراستی ئێمە دەیسوتێنین، لە پاشان فڕەی دەدەین بەناو ئەم دەریاداو بڵاوی ئەکەینەوە چۆن بڵاوکردنەوەیەك ئەڵێن: ئەوگوێرەکەیە خرایەناو ئاگرو کرا بە خشتێكولە پاشان بەبڕبەن ورد کراو فڕەدرا بەناو دەریادا. ئینجا موسا ئامۆژگاری گەلەکەی کردو وتی:

﴿٩٨﴾ بەراستی خوای ئێوە ئەو (ﷲ)یە کە هیچ خوایەکی راستەقینەی تر نیە، بێجگە لە ئەو زاتەو زانیاریو علمی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە.

(٩٩) هەروەکو چۆن لێرەدا داستانی موسامان بۆ باس کردیت هەروا ئێمە بەشێك لە داستانەکانی پێشوت بۆ باس ئەکەین، وە بەراستی داومانە بە تۆ لەلایەنی خۆمانەوە ئامۆژگاریو یادێکی بەرێز کە بریتیە لەم قورئانە پڕخەیرو فەڕەی کە هەرکەس دەستی پێوە بگرێت خۆشبەختو سەرفەرازی هەردوو دنیایە .

(١٠٠) هەرکەسێکیش پشتی تێ بکاتو پەیڕەوی نەکاتو گوێ رایەڵی پێغەمبەر نەبێت، با ئەو کەسە چاك بزانێت کە بەراستی لە رۆژی قیامەتدا بارێك تاوان هەڵ ئەگرێت کە بارێکی زۆر قورسەو ئابڕو بەریەتی.

(١٠١) بۆ هەمیشە تێیدا ئەمێنێتەوە لە ناو سزای ئەو تاوانانەی کە کردویەتی کە سزاکەی دۆزەخو گورزی ئاسنو خواردنەوەی خوێنو کێمی دۆزەخیانە، جا ﷲ جوانتر ئەوکاتەمان بۆرون دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(١٠٢) کاتی سزاو سەر شۆڕی ئەوکەسە کاتێ دەست پێ دەکات کە فو دەکرێت بەسوردا. ئەڵێن: سور بەشێوەی شاخی گایە کە بەئەندازەی بەشەرەکان کونی تێدایە جارێك بە فەرمانیﷲ "**ئیسرافیل**" فوی پێدادەکات هەمو خەڵك ئەمرێتو جارێکی تر فوی پێدا دەکات هەمو زیندو ئەکرێنەوە کە ئەمەی ئێرە لەوەی دووهەمیان نزیکە، جا ئێمە تاوانباران کۆ ئەکەینەوە لەو رۆژەدا کە هەمویان لە بەرسەختی سزایان چاویان شین ئەبێتەوە، ئینجا لەناو خۆیاندا باسی ماوەی ژیانی دنیایان ئەکەن.

(١٠٣) بەشێوەیەکی هێواشی لە نێوان خۆیاندا ئەڵێن، بێجگە لە دە رۆژێك زیاتر نەژیاوین. ﷲ دەفەرموێ:

(١٠٤) بەراستی ئێمە ئەزانین چی دەڵێن ئەوان بەو قسەیان ئەیانەوێ بڵێن ئێمە ئەوەندە نەژیاوین کە بەچاکی ﷲ بدۆزینەوە، کەوابو حەقی سزادانمان نیە، ئینجاﷲ دەفەرموێ: ئێمە ئاگادارین کاتێ کە ژیرترین کەسیان وتی: نەخێر ئێوە لەچاو ئەم نارەحەتیو سەختیەدا کە لەپاش مەرگ دیوتانە ژیانی دنیاتان، بێجگە لە رۆژێك زیاتر نیە. جا لە پێش تەواو کردنی بارو دۆخی دوا رۆژی ستەمکاران خوای گەورە باسی ئەم چیا بەرزو بەهێزانەی زەویمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٠٥) ئەی محمدﷺ لەبارەی چیاکانەوە پرسیارت لێ دەکرێت ئایا ئەو چیا بەهێزانە چییان بەسەردێت؟ بڵێ: پەروەردگارم هەڵیان ئەکەنێتو وەکو خوری شیکراوەیان لێ دەکاتو با وەکو هەور بەم لاو بەولادا ئەیانفڕێنێو ئەیانکات بەلمی شیکراوەو لە پاشان وەکو تۆزی پێ دێتو چاڵیەکانی زەویی پێ رێك دەکات.

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَا يَخَافُ ظُلْمًا وَلَا هَضْمًا ﴿١١٢﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾

(١٠٦) جا زەوی دەکات بەدەشتێکی تەختی کاکی بەکاکی.

(١٠٧) هیچ لاریو چاڵیو چۆڵیو بەرزیونزمیەکی تێدا نابینی. ئینجا ئەچێتەوە سەر باسی پێشو دەفەرموێ:

(١٠٨) لە ئەو رۆژەدا دوای بانگ کەرەکە ئەکەون کە "**ئیسرافیل**"ە بەو شەیپورەکە لێی دەداتو راست ئەبنەوەو بەرەو مەیدانی مەحشەر ئەکەونە رێگاو هەمویان بەرەو مەیدان ملی رێگا دەگرن، وە هەمو دەنگەکان گەردنکەچو زەلیلن بۆﷲ و ناتونن هیچ قسەیەك بکەن تۆ لەو کاتەدا، بێجگە لەچپەو قسەی هیواش هیچ نابیسی. بەڵێ بەراستی ئەورۆژە رۆژێکی پر مەترسیو ئێشو ژانە.

(١٠٩) لەو رۆژەدا شەفاعەتو تکاو پاڵپشتی هیچ سودێکی نیە مەگەر بۆ کەسێك کە خوای بەخشندەو بەسۆز ماوەی پێ دابێتو لەقسەو داخوازیەکەی رازی بێت، پاش ئەوەی کە خەڵك بو حیسابو کیتاب زیندو دەکرێنەوەو لە دەشتی مەحشەر دا کۆ دەکرێنەوە بۆ ماوەیەکی زۆر لەو شوێنە دژوارەدا دەمێنێنەوە، جا ئەو خەڵکە بۆ ئەوەی کەﷲ حیسابو کیتاب لەنێوانیان دا بکات و ئەنجامی هەر لایەنێك دیاری بکات دەچن بۆ لای پێغەمبەرانو هەر لە "ئادەم"وە دەست پێدەکەن یەك لە دوای یەك ئەم تکاو شەفاعەتیان لە لایان (ﷲ)ەو بو بکەن، بەڵام هەمو پێغەمبەران

هەرکام بە هۆیەك دەڵێن ئەو کارە بە ئێمە ناکرێتو هەریەکەیان ئەو خەڵکە دەنێرێ بۆلای پێغەمبەری خواری خۆی تاڵە ئاخر دا دێن بۆلای پێغەمبەرمانﷺ، وەك دەفەرموێ: {...فَأَقُولُ أَنَا لَهَا فَأَسْتَأْذِنُ عَلَى رَبِّي فَيُؤْذَنُ لِي وَيُلْهِمُنِي مَحَامِدَ أَحْمَدُهُ بِهَا لَا تَحْضُرُنِي الْآنَ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ وَأَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيَقُولُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي فَيَقُولُ انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مِنْهَا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ شَعِيرَةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيُقَالُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي فَيَقُولُ انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مِنْهَا مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ أَوْ خَرْدَلَةٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ ثُمَّ أَعُودُ فَأَحْمَدُهُ بِتِلْكَ الْمَحَامِدِ ثُمَّ أَخِرُّ لَهُ سَاجِدًا فَيَقُولُ يَا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ وَقُلْ يُسْمَعْ لَكَ وَسَلْ تُعْطَ وَاشْفَعْ تُشَفَّعْ فَأَقُولُ يَا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي فَيَقُولُ انْطَلِقْ فَأَخْرِجْ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ أَدْنَى أَدْنَى أَدْنَى مِثْقَالِ حَبَّةِ خَرْدَلٍ مِنْ إِيمَانٍ فَأَخْرِجْهُ مِنَ النَّارِ فَأَنْطَلِقُ فَأَفْعَلُ..**/ متفق عليه/ ...جا من بەو خەڵکە دەڵێم: من بۆ ئەو ئەرکە دانراوم جا لە پەروەردگارم داوای ماوەو ئیزن دەکەم ئەوسا ماوەم پێدەداتو سوپاسو ستایشێکی وام تێ دەگەیەنێ کە ئێستا نایزانم، جا بەو شێوە سوپاسو ستایشی دەکەمو دەچمە سوجدەوە پاشان پەروەردگارم دەفەرموێ: ئەی محمد سەرت بەرزکەرەوەو لە سوجدە هەستە، جا بڵێ، قسەت وەرئەگیرێو تکاو شەفاعەت بکە شەفاعەتت بۆ هەیە پێغەمبەر ﷺ دەڵێت: ئەی پەروەردگارم گەلەکەم، گەلەکەم. ﷲ دەفەرموێ: برۆ لەو سزایە دەری بهێنە ئەوکەسەی کە بەئەندازەی دەنکە جۆیەك باوەڕی بوە جا ئەڕۆمو ئەوکارە دەکەم، ئینجا ئەو جۆرە سوپاسو ستایشەی دەکەمەوەو سوجدەی بۆ دەبەم، لە پاشان پێم دەفەرموێ: ئەی محمد سەرت بەرز کەرەوەو لە سوجدە هەستە، دە بڵێ، قسەت وەردەگیرێو داوابکە، پێت دەدرێتو شەفاعەت بکە شەفاعەتت بۆ هەیە پێغەمبەرﷺ دەڵێت: ئەی پەروەردگارم گەلەکەم، گەلەکەم ﷲ دەفەرموێ: برۆ لەو سزایەدەری بهێنە ئەوکەسەی کە بە ئەندازەی گەردیلەیەك یان تۆیی خەرتەلەیەك باوەڕی بوە، جا ئەڕۆمو ئەوکارە دەکەمو ئینجا ئەوجۆرە سوپاسو ستایشەی دەکەمەوەو سوجدەی بۆ دەبەم، لەپاشان پێم دەوترێت: ئەی محمد سەرت بەرز کەرەوەو لە سوجدە هەستە، جا بڵێ، قسەت وەرئەگیرێو داوا بکە پێت دەدرێتو شەفاعەت بکە شەفاعەتت بۆ هەیە پێغەمبەرﷺدەڵێ: ئەی پەروەردگارم گەلەکەم، گەلەکەم. ﷲ دەفەرموێ: برۆ لەو سزایە دەری بهێنە ئەوکەسەی کە بە ئەندازەی خوارتر، خوارتر، خوارتر لە تۆیی خەرتەلەیەك باوەڕی بوە لەو خەڵکە جامنیش ئەوکارە دەکەم}

پێغەمبەرمانﷺچوار جار بەم شێوەیە دەکاتو هەرجارەی بەشێکی دیاری کراو لە خەڵك ئەخاتە بەهەشتەوە، بەهەزاران هەزار سەلامو رەحمەتی خوات لێ بێت ئەی پێغەمبەری ئازیزﷺ داواکارم لە پەروەردگارم منیش بخاتە بەر ئەو شەفاعەتەت. لە ئایەتو حەدیسەکانەوە دەردەکەوێت کەشەفاعەت شەش بەشە:

**یەکەم**: شەفاعەتی گەورە کە تایبەتی پێغەمبەرمانەﷺ وە ئەویش ئەو شەفاعەتەیە کە پێغەمبەرﷺ بۆ رزگاربونی هەمو خەڵك لە دژواری دەشتی مەحشەرو دەستپێکردنی حیسابو کیتاب بەو شێوەیە کە لە سەرەتای ئەم فەرمودە دا هاتوە هەڵدەسێت بو ئەنجام دانی.

**دووهەم**: شەفاعەت بۆ چونە ناو بەهەشت.

**سێهەم**: شەفاعەت بۆ ئەو تاوانبارانەیە کە بە هۆی تاوانەکانیانەوە شیاوی سزاو تۆڵەن، بەڵام بەو شەفاعەتە لەو سزایە رزگاریان دەبێت. **چوارەم**: شفاعەت بۆ ئەو باوەڕدارە تاوانبارانەیە کە چونەتە ناو ئاگری دۆزەخەوە، کە بەو شەفاعەتە لە دوزەخەوە دەردەهێنرێن، ئەهلی سونەو جەماعەت بە کۆی دەنگەوە بەم شەفاعەتە باوەڕیان هەیەو ئەوانەیش کە باوەڕیان پێی نیە بە بیدعەچی دەناسرێن.

**پێنجەم**: شەفاعەت بۆ بەرز بونی پلەی بەهەشتیەکان.

**شەشەم**: شەفاعەت بۆ سوك بونی سزای دۆزخ لە سەر بێباوەڕ کە ئەویش تایبەتە بە ئەبوتالیبی مامی پێغەمبەرەوەﷺ کە ئەویش بە هۆی ئەو پارێزگاریو پشتگیریەی کە لەدنیادا لە پێغەمبەرمانی ﷺ کردوە، بەڵام بەداخەوە باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمانﷺ نەهێناوە. ئەم شەفاعەتانە جگە لە یەکەمو شەشەم تایبەتە بە باوەڕدارانەوە ئەوەی کە لە سەر کوفرو شیرك مردووە لەم شەفاعەتانە بێ بەشە.

ئینجا خوای خاوەن دەسەڵات ئامۆژگاری مرۆڤ دەکاتو هەڵیئەنێت کە قسەی خراپو ئیشی ناپاك ئەنجام نەدات، چونکە ﷲ زانیاری بەسەر هەمو هەڵسو کەوتێکی بەندەکانیدا هەیەو دەفەرموێ :

(١١٠) خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەوان ئەنجامیان داوەو ئەنجامی ئەدەنو هیچی لێ ون نابێو زانیاری بەوردو درشتی کردارو وتارو نیەتیاندا هەیە بەڵام ئەوان زانیاری تەواویان نیە بەسەر زاتی (ﷲ)داو ناتوانن بەشێوەیەکی سنوردار ئەو زاتە بناسن، بەڵکو هەرچی لە بارەیەوە زانراوەو ئەزانرێت شتێکی زۆر کەمە.

(١١١) جا لەو ڕۆژەدا هەمو دەمو چاوەكان شەرمەندەو زەبونن بۆ ئەو زاتەی كەنامرێو ژیانی تەواوی زیندوەكان بەو ڕاوەستاوەو مانی ئەم بونەوەرە بەو بەندە، جا چۆنی ویست هەروا دەبێ، وە بەراستی ڕەنجەڕۆیە ئەوكەسەی كە باری تاوانو زوڵمی هەڵگرتوە.

(١١٢) خۆهەر كەسێك ئیشی چاك بكاتو باوەڕدار بێ با نەترسێت لەوەی كەستەمی لێ بكرێت یان خراپەی لەسەر زیاد بكرێت، وە یان چاكەی لێ كەم بكرێتەوە، ئینجا خوای باڵادەست دەفەرموێ:

(١١٣) جا هەر ئاوەها ئێمە ناردمانە لات قورئانێكی عەرەبی و هەڕەشەی خۆمان بە شێوەی جۆراو جۆر لەناو ئەودا باسكردوە بەڵكو ئەوان بترسنو خۆیان بپارێزن لەتاوانو خراپە، یان ئەم قورئانە ببێتە هۆی ئامۆژگاریو سەربەرزیو ناوو شۆرەتو پلەو پایەی بەرزی دنیاو دوا ڕۆژ. بەڵێ بەراستی ئەم قورئانە ڕێزو شەرەفی دا بەو كەسانەی كە بەراستی هەڵیان گرتو پەیڕەویان كرد لە شوانیەتیەوە كردنی بە پێشەواو مامۆستای تەواوی جیهان. ئەم ئایەتەو ئایەتانی تر كە باس لەوە دەكەن كە قورئان بە عەرەبی بۆسەر پێغەمبەرمانﷺ دابەزیوە، بەڵگەن لە سەر ئەوەی كە ئەم قورئانە هەم بە ماناو هەم بە وشە لەلایەن پەروەدگارەوە ڕوانەكراوە چونكە ماناو مەفهوم عەرەبی یان غەیرە عەرەبی نیە بۆ نمونە "ئاو" لە هەمو زمانەكان دا ماناو مەفهومی دیاریەو ناگۆڕێ، بەڵام هەركام بۆ دەربڕینی ئەو مانایە پیتو وشەیەكی تایبەت بە خۆی بەكار دەهێنێت. وە هەروەهاش كاتێك دەوترێت ئەم قورئانە بە عەرەبی ڕوانە كراوە، واتە: بە وشەو پیتی عەرەبی ڕەوانە كراوە، وە ئەمە بە پێچەوانەی ئەو كەسانەیە كە دەڵێن: تەنها ماناو مەفهومی قورئان بۆ پێغەمبەرﷺ دابەزیوەو پێغەمبەر خۆی بۆ خۆی ئەو ماناو مەفهومەی بە زمانی عەرەبی ڕاگەیاندوە.

(١١٤) جا بێ عەیبو بێنیازەو باڵادەستە (ﷲ) یەك كە پادشای هەمو بونەوەرەو ڕاستە لەهەمو بەڵێنو قسەو هەڕەشەیدا، جا پەلەمەكە ئەی محمدﷺ بەخوێندنەوەی ئەو قورئانەی كە بۆت دێت لە پێش ئەوەی كەبەتەواوی وەحی بكرێتە لات. ئەڵێن: پێغەمبەر ﷺ زۆر بەپەلە لەگەڵ جوبرەئیل قورئانەكەی ئەخوێندەوە نەوەك لەبیری بچێتەوە، جا ﷲ فەرموی: پەلە مەكەو گوێ بگرە تاوەحی تەواو ئەبێو مەترسە كە لە بیرت بچێتەوە ئێمە ئەتپارێزین لە لەبیر چونەوە تۆ تەنها پشت بە ئێمە ببەستەو بڵێ: ئەی پەروەردگارم زانیاریم بۆ زیاد بكە.

(١١٥) ئەوسا بەراستی ئێمە وەحیمان كردە لای ئادەمو تێمان گەیاند كە لەو درەختە نەخوات، بەڵام ئەو دروستكراوە بەرێزە

فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۗ وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدۡ عَهِدۡنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبۡلُ فَنَسِيَ وَلَمۡ نَجِدۡ لَهُۥ عَزۡمٗا ﴿١١٥﴾ وَإِذۡ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلۡنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوّٞ لَّكَ وَلِزَوۡجِكَ فَلَا يُخۡرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلۡجَنَّةِ فَتَشۡقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعۡرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظۡمَؤُاْ فِيهَا وَلَا تَضۡحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسۡوَسَ إِلَيۡهِ ٱلشَّيۡطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلۡ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلۡخُلۡدِ وَمُلۡكٖ لَّا يَبۡلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنۡهَا فَبَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيۡهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾ قَالَ ٱهۡبِطَا مِنۡهَا جَمِيعَۢاۖ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ فَإِمَّا يَأۡتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدٗى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشۡقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنۡ أَعۡرَضَ عَن ذِكۡرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةٗ ضَنكٗا وَنَحۡشُرُهُۥ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ أَعۡمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرۡتَنِيٓ أَعۡمَىٰ وَقَدۡ كُنتُ بَصِيرٗا ﴿١٢٥﴾

ئەو فەرمانەی لە بیر چویەوەو ئێمە نەمان دی كەوا ئادەم خاوەنی بڕیارو هەڵوێستێك بێت بۆ خۆی. جا خوای باڵادەست ئەو ڕوداوەی ئادەممان بۆ باس دەكاتو دەفەرموێ:

(١١٦) جا بیر بكەرەوە لەو كاتەی كە ئێمە بە فریشتەكانمان وت: كە سوجدە ببەن بۆ ئادەم ئەوانیش هەمویان سوجدەیان بردو فەرمانی (ﷲ)یان ئەنجام دا بێجگە لە ئیبلیس كە شەیتانەو سوجدەی نەبرد،

(١١٧) جا وتمان ئەی ئادەم بێگومان كە ئەمە دوژمنی خۆتو هاوسەرەكەیشتە جا ئاگاتان لەخۆتان بێت كە دەرتان نەكات لەو بەهەشتەو نازو نیعمەتەدا، ئەوسا ئیتر ئەوكاتە ناڕەحەت دەبیو ئەبێ بەتەلاشو زەحمەت بژێوی خۆت پەیدا بكەیتو گرفتاری وبگرەو بەردەی زۆرت بۆ پەیدا دەبێت.

(١١٨) بێگومان لەم بەهەشتەدا ژیانێكی وات بۆ هەیە كە هەرگیز نە برسیت ئەبێو نە ڕوتاڵ دەبیت.

(١١٩) خۆ بیگومان تۆ لە ناویا نەتینوت ئەبێو نەگەرما، ئەمە ئامۆژگاری خوای باڵا دەست بو بۆ ئادەم، بەڵام شەیتان دەستی لەكۆڵ ئادەم نەكردەوەو هەوڵی دا تا لەو بەهەشتەدا دەریكرد.

(١٢٠) لەبەر ئەوە شەیتان بۆ ئەنجامدانی بڕیارە خراپەكەی ختۆكەی دڵی ئادەمی داو دنەی داو وتی: ئەی ئادەم ئایا ئەتەوێ كە من ڕێنماییت بكەم بۆ خواردنی بەری درختێك كە ژیانی

قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ فِى مَسَٰكِنِهِمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامًا وَأَجَلٌ مُّسَمًّى ﴿١٢٩﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ غُرُوبِهَا ۖ وَمِنْ ءَانَآئِ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْ وَأَطْرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرْضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ زَهْرَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَرِزْقُ رَبِّكَ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصْطَبِرْ عَلَيْهَا ۖ لَا نَسْـَٔلُكَ رِزْقًا ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُكَ ۗ وَٱلْعَٰقِبَةُ لِلتَّقْوَىٰ ﴿١٣٢﴾ وَقَالُوا۟ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓ ۚ أَوَلَمْ تَأْتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِى ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوْ أَنَّآ أَهْلَكْنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِۦ لَقَالُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلْ كُلٌّ مُّتَرَبِّصٌ فَتَرَبَّصُوا۟ ۖ فَسَتَعْلَمُونَ مَنْ أَصْحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِىِّ وَمَنِ ٱهْتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

هەمیشەیی‌و مولکی نەبراوەت پێ‌ئەدا؟ دیارە ئادەمیش حەزی لەوە دەکرد کە ژیانی هەمیشەیی هەبێ‌و مولکێکی‌وایشی دەست بکەوێت کە هەرگیز نەفەوتێ، لەبەر ئەوە ڕێنمایەکەی شەیتانی بە شتێکی چاك زانی‌و بەگوێی کردو درەختی قەدەغەکراوی بە ئادەم نیشان دا.

(١٢١) جا ئادەم‌و هاوسەرەکەی لێیان خواردو فەرمانی (الله)یان لە بیر نەماو دوچاری تاوان بون، جا لەبەر ئەوە پۆشاکەکانیان دڕاو عەیبیان کەوتە دەر، ئەوسا بە پەلە هەوڵیان دا کە خۆیان بە پەلکی درەختەکانی ئەو باخەی کە تێیدابون داپۆشن، بەڵێ ئادەم سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کردو لەو ئەرکەی کە پێی سپێررابو لای دا.

(١٢٢) لە پاشان پەروەردگاری هەڵی بژاردو تەوبەی لێ وەرگرت‌و ڕێنمایی کرد.

(١٢٣) فەرموی: ئەی ئادەم‌و حەواو شەیتان هەموتان دابەزنە سەر زەوی، هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن پاش ئەوەی کە چوونە سەرزەوی، جا ئەگەر ڕێنمایەکەرو چاوساق لە لای منەوە هاتە لاتان‌و ڕێگای ڕاستی پیشان دان، ئەوسا هەرکەسێك پەیڕەوی لەو ڕێنمایەکەرەی کرد نە ڕێگا ون ئەکات‌و نە بەدبەخت ئەبێ.

(١٢٤) خۆ ئەوکەسەیش کە پشت بکاتە زیکری من کە قورئانە، بێگومان بۆ ئەوکەسە ژیانێکی سەخت‌و پڕناسۆری ئەبێ لەدنیاداو لە ڕۆژی قیامەتیشدا بەکوێری حەشری دەکەین،

(١٢٥) جا ئەو کاتە ئەڵێ: ئەی پەروەردگارم بۆ بە کوێری حەشرم دەکەی؟ خۆ من لەدنیادا چاوم ساق بو.

(١٢٦) (الله)یش دەفەرموێ: ئاوا بەکوێری حەشرت دەکەین، چونکە لە دونیادا کە ئایەتەکانی ئێمە هاتەلات، جا ئەو کاتە تۆ ئەوانت لە بیری خۆت بردەوەو خۆتت لێ کوێر کردن‌و هەر ئاوەها ئەمڕۆ کە ڕۆژی قیامەتە تۆ لە بیر ئەبرێیتەوەو لە تۆڵەی تاوانەکانتا لە ناو دۆزەخ دا بەجێ دەهێڵرێیت.

(١٢٧) جا هەر ئاوەها ئێمە لەوکەسەی کە زیادەڕەوی دەکات‌و فەرمانی الله بەسوك دەگرێت‌و باوەڕی بە ئایەتەکانی پەروەردگاری خۆی نیە هەم لە دنیاداو هەم لەقیامەتدا تۆڵەی لێ وەرئەگرین بەڵام سزای دواڕۆژ زۆر زۆر بەهێزترو دوانەهاتو ترە. پاشان دەفەرموێ:

(١٢٨) ئایا نابێ بە هۆی ڕێنمایی بۆیان ئەو هەمو خەڵك‌و وڵاتانەی کە لە پێش ئەوان دا لە ناومان بردون‌و ئەوان ئێستا بەناو جێگاکانیاندا هاتو چۆ ئەکەن‌و شوێنەکانیان بەچاوی خۆیان دەبینن؟ واتە: ئەبوایە ئەوانە کاری تێبکردنایەو لە خراپەو تاوان وازیان بهێنایەو پەیڕەوی فەرمانی (الله)یان بکردایە، چونکە بێگومان ئا لەوانەدا چەندین بەڵگەی گەورە هەیە بو ئەو کەسانەی کەوا خاوەنی عەقڵن. کەوابو ئەوەی کە بیر ناکاتەوە بەگوێرەی ئەم ئایەتە پیرۆزە هەر وەك ئەوە وایە کە عەقڵی لەدەست داوە، بەڵام حیسابی شێتی بۆ ناکرێت‌و لە ڕۆژی قیامەتیشدا خۆی دان بەبێ عەقڵی خۆیدا ئەنێ‌و ئەڵێ: ئەگەر عەقڵم ببوایە ئێستا لەم ژیانە سەختەدا نەدەبوم. ئینجا پەروەردگار ئەوەمان تێدەگەیەنێ کە ئەگەر ئەمڕۆ تاوانباران‌و ستەمکاران ئەبینن کە زوو تۆڵەیان لێ‌وەرناگیرێ لەبەر خۆشەویستی‌و چاکی ئەوان نیە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە پەروەردگاری عالەم بۆ هەمو شتێك ماوەیەکی داناوە تا ئەوماوە تەواو نەبێ کابرا هەروا دەمێنێ. جا پەروەردگاریش لێرەدا دەفەرموێ:

(١٢٩) خۆ ئەگەر بڕیاری پەروەدگارت پێش نەکەوتایە بەوەی کە کاتی سزایان دیاری کراوو ناو براوە، دڵنیا بە کە ئێستا ئەوان لەسەر ئەو تاوانانەیان سزا درا بون.

(١٣٠) جا کەوابو ئەی موحەممەد ﷺ، وە ئەی بانگ کەری ڕێبازە ڕاستەقینەکەی الله پایەدارو خۆگربە لە سەر ئەو قسە ناشرینانەی کە دەیکەن‌و خۆتت بەلاوە سوك‌و کەم نەبیٚ‌و تەسبیحاتی پەروەردگارت بکەو سوپاسی بکە لە سەر نیعمەتەکانی‌و نوێژی بۆبکە لە پێش ڕۆژهەڵهاتن‌و پێش ئاوا بوونیدا، واتە: ئەو دووکاتە، پاش نوێژی بەیانی تاخۆرکەوتن‌و پاش نوێژی عەسر تا خۆر ئاوابون دووکاتی پیرۆزن بۆ یادو زیکرو تەسبیحاتی الله.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {يَتَعَاقَبُونَ فِيكُمْ مَلَائِكَةٌ بِاللَّيْلِ وَمَلَائِكَةٌ بِالنَّهَارِ وَيَجْتَمِعُونَ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ وَصَلَاةِ الْعَصْرِ ثُمَّ يَعْرُجُ الَّذِينَ بَاتُوا فِيكُمْ فَيَسْأَلُهُمْ وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِمْ كَيْفَ تَرَكْتُمْ عِبَادِي فَيَقُولُونَ تَرَكْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ وَأَتَيْنَاهُمْ وَهُمْ يُصَلُّونَ./متفق عليه/ فریشتەیانێك بە ڕۆژو فریشتەیانێکیش بە شەو یەك لەدوای یەك دێن بۆ ناوتان، وەلە کاتی نوێژی بەیانی‌و عەسردا هەم فریشتەکانی ڕۆژو هەم فریشتەکانی شەو لە سەر زەوی کۆ دەبنەوەو پاشان ئەو فریشتانەی کە شەویان لە ناو ئێوە دا کردوەتەوە بەرز دەبنەوە، جا پەروەردگار پرسیاریان لیٚ دەکات کە بەندەکانی منتان چۆن بە جیٚهێشت، لە حاڵێکدا خۆی ئاگادارترە بەوان، جا ئەوان وەڵام دەدەنەوە کە ئێمە ئەوانمان بە جیٚهێشت لە حاڵێکدا کە نوێژیان دەخوێندو ڕۆیشتین بۆ لایان لە حاڵێکدا کە نوێژیان دەخوێند}

وە لە بەشێك لە شەودا کە کاتی نوێژی عیشاو مەغریب‌و شەو نوێژ دەگرێتەوە، وە لە هەردووگۆشەکانی ڕۆژەوە کە کاتی نوێژی بەیانی‌و نیوەڕۆو عەسرە، تەسبیحات بکە بەڵکو الله پاداشتێکی وات پیٚ بدات کە تۆ ڕازی بیت. لێرەدا هێمایەکی تێدایە بۆ گرنگی کاتی پێنج فەرزەکان،

ئینجا الله ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەیﷺ دەکات کە بە جوانی‌و ڕازاوەیی ماڵی دنیا خۆی خەریك نەکات‌و دڵنیا بێت کە ئەوەی پەروەدگاری بۆی داناوە لە هەمو دنیا بەنرخ ترەو دەفەرموێ:

(١٣١) زۆر سەیری ئەو سەروەت‌و سامانەی دنیاو ئەو نازو نیعمەتە زۆرەی کە ئێمە داومانە بە هەندێك لە بێباوەڕان مەکەو چاوت بە شوێنیەوە نەبێت، ئەوە هەر جوانیەکی ژیانی دونیایەو بۆ ئەوەیە کە بەو شێوەیە تاقییان بکەینەوەو سەرگەرم‌و بیٚ ئاگایان بکەین لەدوا ڕۆژ، وە رزق‌و ڕۆزی پەروەردگارت چاکترەو درێژ خایەن ترە بۆت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت: { لَوْ كَانَتْ الدُّنْيَا تَعْدِلُ عِنْدَ اللهِ جَنَاحَ بَعُوضَةٍ مَا سَقَى كَافِرًا مِنْهَا شَرْبَةَ مَاءٍ./الترمذي، ابن ماجه، صححه الالبا / ئەگەر هەمو دنیا لە لای پەروەردگار بە ئەندازەی باڵی مێشولەیێك نرخی ببوایە، قومە ئاوێکی لەم دنیادا بە کافر نەدەدا }

(١٣٢) ئەی محمد ﷺدەستور بدە بە ئەهلەکەت با نوێژ بکەن، وە دەوام بکە لە سەری‌و خۆت بگرەو مشوری دنیا مەخۆ، ئێمە داوای ڕۆزی لەتۆ ناکەین ئێمەین ڕۆزی بە تۆ دەدەین، وە ئایندەیش هەر بۆ تەقواو پارێزکاریە.

کەوابو تۆ لەسەر نوێژ کردن‌و فەرمان دا بە ئەهلەکەت خۆ بگرەو بەردەوامبە سەر ئەنجام تۆ دەیبەیتەوەو بێباوەڕان‌و تاوانباران هەرچییان هەبیٚ‌و هەر چۆن بژین سەرئەنجام دەشکێن‌و لەناو دەچن‌و دێنەوە بەردەستی من. ئینجا خوای زاناو ئاگادار باسی داخوازی ئەو کافرانە دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٣) جا ئەوان وتیان: ئای کاشکایە موعجیزەیەکی لە لایەن پەروەدگاریەوە بۆ بهێنایەن تا ڕاستی ئەومان بۆ دەربکەوتایە، (الله)یش بەر پەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: ئایا ئەو بەڵگە ڕۆشنەی کە لە پەڕاوەکانی پێشودا باسکراوە، نەگەیشتوە بەوان؟ واتە: لە تەورات‌و ئینجیل دا، دەی ئەوان ئەگەر ڕاستییان ئەوێت با تەماشای بکەن بزانن ئەم پێغەمبەرە هەمان پێغەمبەرنیە کە لەوێدا باسکراوە؟

(١٣٤) خۆ ئەگەر ئەوانمان پێش هاتنی ئەو پێغەمبەرەﷺ بەسزایەك لە ناو ببردایە دیسان زماندرێژیان دەکردو ڕەخنەیان دەگرت‌و لە ڕۆژی قیامەتدا دەیانوت ئەی پەروەردگارمان با تۆ پێش تر نێرراوێکت بۆ ئێمە بناردایە، جا ئەو کاتە پێش ئەوەی کە ئاوا سەر شۆڕو سوك ببین، ئێمە دوای ئایەتەکانی تۆ دەکەوتین و دژایەتیمان نەدەکرد، واتە: پێغەمبەرمان نارد بەڵام ئەوان ئابەم شێوەیە ڕەخنەی لیٚ دەگرن‌و ئەگەر نەیشمان ناردایە لە ڕۆژی قیامەتدا ئاوایان دەوت. جا الله بەپێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:

(١٣٥) پێیان بڵیٚ: هەمومان با چاوەڕوان بین جا بەم زوانە دەزانن کێیە کە لەسەر ڕێگای ڕاستە، وەکێیە لەسەر ڕێگای هیدایەت‌و خۆشبەختی . وە کێیشە کە لەسەر ڕێچکەو ڕێبازی چەوتەو گومڕاو شەرمەزارە؟

٢١ سُورَةُ الأَنبِيَاءِ ١١٢

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

اقْتَرَبَ لِلنَّاسِ حِسَابُهُمْ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ مُّعْرِضُونَ ﴿١﴾ مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ إِلَّا اسْتَمَعُوهُ وَهُمْ يَلْعَبُونَ ﴿٢﴾ لَاهِيَةً قُلُوبُهُمْ ۗ وَأَسَرُّوا النَّجْوَى الَّذِينَ ظَلَمُوا هَلْ هَٰذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ ۖ أَفَتَأْتُونَ السِّحْرَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّي يَعْلَمُ الْقَوْلَ فِي السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ ۖ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿٤﴾ بَلْ قَالُوا أَضْغَاثُ أَحْلَامٍ بَلِ افْتَرَاهُ بَلْ هُوَ شَاعِرٌ فَلْيَأْتِنَا بِآيَةٍ كَمَا أُرْسِلَ الْأَوَّلُونَ ﴿٥﴾ مَا آمَنَتْ قَبْلَهُم مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَاهَا ۖ أَفَهُمْ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَمَا أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِي إِلَيْهِمْ ۖ فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧﴾ وَمَا جَعَلْنَاهُمْ جَسَدًا لَّا يَأْكُلُونَ الطَّعَامَ وَمَا كَانُوا خَالِدِينَ ﴿٨﴾ ثُمَّ صَدَقْنَاهُمُ الْوَعْدَ فَأَنجَيْنَاهُمْ وَمَن نَّشَاءُ وَأَهْلَكْنَا الْمُسْرِفِينَ ﴿٩﴾ لَقَدْ أَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ كِتَابًا فِيهِ ذِكْرُكُمْ ۖ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠﴾

## ٢١ سورەتی ئەنبیا ١١٢

سورەتی ئەنبیا سورەتی بیستو یەکەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، سەدو دوانزە ئایەتەو ناوی شانزە پێغەمبەری تێدایە کە هیچ سورەتێکی تر ئەوەندە ناوی لە خۆدا کۆ نەکردوتەوە جگە لە سورەتی ئەنعام کە ناوی هەژدە لە پێغەمبەرانی تێدایە، بەڵام پاش ئەم سورەتە دابەزیوە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی حەفتاو یەکەمەو پاش سورەتی **(السجدة)** و پێش **(النحل)** دابەزیوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ کاتی حیسابو لێکۆڵینەوە لەخەڵك نزیك بویەوە لە کاتێکدا کە ئەوان لە بێ ئاگایو بێهۆشی دنیادانو پشتیان لە خوا پەرستیو ئایینکردوە. وا بە دنیاو بەخۆشیەکانی دنیا سەرقاڵن کە دەڵێیت هەر بۆ ئەم دنیایە دروستکراونو مردنو حیسابو کیتابێکیش لە ئارادا نیە!

پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: (**بُعِثْتُ أَنَا وَالسَّاعَةَ كَهَاتَيْن**/متفق علیه/ واتە: هاتنی من و قیامەت وەك ئەم دو پەنجە واین، هیچ لە نێوانماندا نیە)

﴿٢﴾ جا هیچ ئامۆژگارییەکی تازەی یەك لەدوای یەکیان لە لایەن پەروەردگاریانەوە بۆ نەهاتوە مەگەر ئەوان بیستبێتیانوگاڵتەیان پێ کرد بێت.

﴿٣﴾ چونکە دڵیان بێ ئاگایەو سەرخۆشی ژیانە کورتەکەی دنیایە، وە ئەو موشریكو ستەمکارانە بەشێوەی نهێنی چپە ئەکەن لەنێوان خۆیانداو دەڵێن: ئەمە بێجگە لەوەی کە مرۆڤێکە وەکو ئێوە شتێکی تر نیە، واتە: پێغەمبەر نیەو باوەڕی پێ مەکەن بەڵکو جادوگەرە، ئایا ئێوە باوەڕ بەو جادوە ئەکەن لە حاڵێکدا کە ئێوە ئەو هەڵسوکەوتو قسە کاریگەریانەی ئەبینن؟ وائەزانن کە مرۆڤێکە وەکو ئێوە، ئینجا خوای زانا هەڕەشەیان لێ ئەکاتو دەفەرموێ:

﴿٤﴾ ئەی محمدﷺبڵێ، یان محمدﷺوتی: بەراستی پەروەردگاری من ئاگای لەو قسانە هەیە کە لە ئاسمانو لەزەویدا دەکرێت، وە ئەو زاتە بیسەری قسەکانتانەو زانایە بە کردارەکانتان.

﴿٥﴾ بەڵکو دەڵێن: ئەو قسانەی محمدﷺشتێکی پڕوپووچن بەڵکو دەڵێن: ئەو درۆ بە دەم خواوە دروست ئەکاتبەڵکو دەڵێن: نەخێر ئەو شاعیرە دەبا ئەگەر راست دەکات ئایەتێکمان بۆ بهێنێت وەکو چۆن پێغەمبەرانی رەوانە کراوی پێشو هەریەکەی بەڵگەیەکی هێناوە بۆ گەلەکەی وەکو وشتری ساڵحو عەسای موساو زیندوکردنەوەی مردوان بۆ عیسا، واتە: بێباوەڕانی خوانەناس کاتێ کە دژایەتی پێغەمبەرانو ئایین ئەکەن بەسەدان درۆ دروست ئەکەن بۆ سارد کردنەوەی خەڵكو رێ گرتن لە ئایین هەر کاتو ساتەی بە شێوەیەك ناوی ئەبەن بەڵام ئایین موڵکی (اللّٰه)یەو خۆی خاوەنیەتی سەر ئەنجام بەرزیو سەرکەوتن هەر بۆ ئەوەو بەکەس ناگۆڕێ، بەراستی ئەو بێباوەڕانە پێغەمبەریان ﷺ هەرلە منداڵییەوە دەناسیو دەیانزانی نەخوێندەوارەو پاشان ئەم قورئانە پڕلە زانستو داناییەی بۆ هێنان کە موعجیزەیەکی هەتاهەتاییە، بەڵام ئەوان ئەمەیان بە موعجیزە هەژمار نەدەکردو داوای موعجیزەی کاتیان لێ دەکرد؟! وە هەر جارەو قسەیەکیان دەکرد، جارێك دەیان وت قسەی پڕوپوچە، جارێکیتر جوانی وریكو پێکی ئایەتەکان وای پێدەکردن کە بڵێن نەخێر ئەوە شاعیرێکی تەواوە، ئینجا اللّٰه دەفەرموێ:

﴿٦﴾ گەلانی پێشو باوەڕیان بەو نیشانانە نەهێنا کە خۆیان لە پێغەمبەرە کانیان داوایان کرد بو، جا ئێمەش لەناومان بردندەی ئایا ئەوانەی کە داوای موعجیزەو نیشانەت لێ دەکەن ئەگەر بۆیان رەوانە بکەین باوەڕ دەهێنن؟ دیسان اللّٰه لە وەڵامی ئەوەدا کە دەڵێن: چۆن دەبێ پێغەمبەر مرۆڤێك بێ وەکو ئێمە دەفەرموێ:

﴿٧﴾ ئەی محمدﷺئێمە هیچ پێغەمبەرێکمان لە پێش تۆدا رەوانە نەکردوە، مەگەر پیاوانێك بوون لە نەوەی ئادەم کە وەحیمان

وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿١١﴾ فَلَمَّا أَحَسُّوا بَأْسَنَا إِذَا هُم مِّنْهَا يَرْكُضُونَ ﴿١٢﴾ لَا تَرْكُضُوا وَارْجِعُوا إِلَىٰ مَا أُتْرِفْتُمْ فِيهِ وَمَسَاكِنِكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْأَلُونَ ﴿١٣﴾ قَالُوا يَا وَيْلَنَا إِنَّا كُنَّا ظَالِمِينَ ﴿١٤﴾ فَمَا زَالَت تِّلْكَ دَعْوَاهُمْ حَتَّىٰ جَعَلْنَاهُمْ حَصِيدًا خَامِدِينَ ﴿١٥﴾ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاءَ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَاعِبِينَ ﴿١٦﴾ لَوْ أَرَدْنَا أَن نَّتَّخِذَ لَهْوًا لَّاتَّخَذْنَاهُ مِن لَّدُنَّا إِن كُنَّا فَاعِلِينَ ﴿١٧﴾ بَلْ نَقْذِفُ بِالْحَقِّ عَلَى الْبَاطِلِ فَيَدْمَغُهُ فَإِذَا هُوَ زَاهِقٌ ۚ وَلَكُمُ الْوَيْلُ مِمَّا تَصِفُونَ ﴿١٨﴾ وَلَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ۚ وَمَنْ عِندَهُ لَا يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِهِ وَلَا يَسْتَحْسِرُونَ ﴿١٩﴾ يُسَبِّحُونَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ لَا يَفْتُرُونَ ﴿٢٠﴾ أَمِ اتَّخَذُوا ءَالِهَةً مِّنَ الْأَرْضِ هُمْ يُنشِرُونَ ﴿٢١﴾ لَوْ كَانَ فِيهِمَا ءَالِهَةٌ إِلَّا اللَّهُ لَفَسَدَتَا ۚ فَسُبْحَانَ اللَّهِ رَبِّ الْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٢٢﴾ لَا يُسْأَلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْأَلُونَ ﴿٢٣﴾ أَمِ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ ءَالِهَةً ۖ قُلْ هَاتُوا بُرْهَانَكُمْ ۖ هَٰذَا ذِكْرُ مَن مَّعِيَ وَذِكْرُ مَن قَبْلِي ۗ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ الْحَقَّ ۖ فَهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٢٤﴾

کردوەتە لایان، واتە: ئێمە هەرگیز فریشتەمان نەناردوە بۆ نەوەی ئادەم، بەڵکو هەرلەم مرۆڤە خۆی نێرراومان هەڵبژاردوە، جا ئەگەر باوەڕ ناکەن بڵێ: با پرسیار بکەن لەوانەی کە زانان ئەگەر خۆتان نازانن، واتە: پرسیار لە زانایانی جولەکەو گاور بکەن بزانن کە ئەوان چی دەڵێن؟ مەگەر ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو عیساو موساو پێغەمبەرانی تر لە نەوەی ئادەم نەبوون؟

﴿٨﴾ خۆ ئەوانمان نەکردوە بەتەنێکی وا کە هیچ خواردنێك نەخۆن، وە ژیانی هەمیشەیمان پێ نەداون بەڵکو ئەوانیش وەك هەمو خەڵکی تر خواردنیان خواردوەو مردویشن.

﴿٩﴾ لە پاشان ئێمە ئەو بەڵێنەی کە بە ئەوانماندا هێنامانە دی، جا ئەوانمان رزگارکردو دەرچو لە یاسا کانیشمان لە ناوبرد. مرۆڤی کافرو خوانەناس هەندێ جار بەستەمکارو هەندێ جار بەلە سنور دەرچوو هەندێ جاریش بەتاوانبارو زیادەڕەو ناو ئەبرێن، چونکە کافرو خوانەناس هەمویان ئەوسیفەتە ناپەسەندانەیان تێدایە، جا هەر جارێك بە یەکێکیان ناوئەبرێت، بەڵام مەرج نیە کە هەرکەسێك ئەو سیفەتەی تێدابێت کافرو خوانەناس بێت.

﴿١٠﴾ بێگومان پەڕاوێکمان بۆ ئێوە ناردوەکە سەربەرزیو خاوەن شکۆیی ئێوەی تێدایە ئەگەر دەستی پێوە بگرنو پەیڕەوی بکەن، دەی ئایا ئێوە لەم راستیە تێناگەنو عەقڵتان ناخەنەکار کە بیر بکەنەوەو ئەو پلەبەرزو رێزە گرنگە بۆخۆتان وەرگرن؟ ئایا ناتانەوێ بەسەر بەرزی بژینو بەسەر بەرزی بمرن؟

﴿١١﴾ خۆ زۆر گەلو وڵاتمان پشت شکاندو لەناومان بردوون، چونکە ستەمکارو بێباوەڕبوون، وەپاش ئەوان گەڵێکی ترمان پلەو پایە پێ داوەو لەم خاکەدا جێ گیرمان کردوون، جا ئێوەش ئاگاتان لەخۆتان بێ ئەگەر لەسەر بێدینیو کوفر بڕۆن هەمان ئیشتان لەگەڵدا ئەکرێت.

﴿١٢﴾ ئەوانەی کە داوایان دەکرد با سزا بێت کاتێ کە هەستی هاتنی سزایان کرد لە ترسا دەست دەکەن بە پەلەقاژەو راکردن بەم لاو بەولادا، جا لەو کاتەدا بە گاڵتە پێکردنەوە پێیان دەوترێت:

﴿١٣﴾ رامەکەنو بۆ کوێ دەچن بگەڕێنەوە بۆ ناو ئەو نازو نیعمەتانەی کە زۆر بۆی ماندو بوونو ئەو جێگاو ماڵانەی کە رەنجی چەندین ساڵەتان بو، بەڵکو داوای شتێك لەو سەروەتو سامانە خۆشەویستەی دنیاتان لێ بکرێتو لەم سزایە رزگار ببن، بەڵام ئەوان لەم کاتەدا بەچاکی دەزانن کە تازە دێرەو کار لە کار ترازاوەو دادو قاڵو راکردن هیچ دەردێکیان بۆ دەوا ناکاتو بە چاوی خۆیان دەبینن کە چۆن ئەو هەمو سەروەتو سامانەیان لەناو دەچێتو لێیان دابڕ دەکرێتو کۆشکو بیناکانیان بەسەر یەك دا دەڕۆخێت تابەم شێوەیە ئێشو ژانیان زیاتر ببێت، ئەوسا دان بەخراپیو ستەمکاری خۆیاندا ئەنێن.

﴿١٤﴾ دەڵێن: ئەی هاوار بۆ ئێمە بێگومان ئێمە ستەمکار بوینو ستەممان لەگەڵ خۆمانو هەمو دەوروبەرماندا کرد. بەڵام پاش هاتنی سزا تازە ئەو دانپێدانانو پەشیمان بوونەوە سودیان پێ ناداتو سزایان لەسەر لانابات.

﴿١٥﴾ بەردەوام ئەمە داوای ئەوانەو هەر ئاوا هاواردەکەن هەتا هەمویانمان لە ناو بردنو چەن وملو بێ گیان کەوتن بەسەر یەکدا، جا ئەمە وانەیەکە بۆئەم گەلەی پێغەمبەرﷺو ئەبێ ئاگایان لە خۆیان بێتو دوچاری هەڵەی ئەوان نەبن تا وەك ئەوان توشی سزا نەبن، ئینجا اللَّهُ دەفەرموێ:

﴿١٦﴾ ئێمە ئاسمانو زەوی و ئەوەی لە نێوانیاندایە بۆ گەمەو گاڵتە دروستمان نەکردوون پاکو بێگەردی بۆ ئەو زاتەیە کە کردارەکانی دورن لە پرو پوچیو بێ سودی. ئینجا لە وەڵامی ئەوانەی کە دەڵێن لە نێوان خواو جنۆکەدا پەیوەندی ژنو ژن خوازی هەیە دەفەرموێ:

﴿١٧﴾ ئەگەر ئێمە بمان ویستایە هاوسەر بۆخۆمان دانێین هەر لەلای خۆمان دروستمان دەکرد، بێگومان ئێمە شتی واناکەین چونکە پێویستیمان بە هاوسەر نییە.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِيٓ إِلَيۡهِ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعۡبُدُونِ ﴿٢٥﴾ وَقَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَلَدٗاۗ سُبۡحَٰنَهُۥۚ بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ﴿٢٦﴾ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٧﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ﴿٢٨﴾ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ كَانَتَا رَتۡقٗا فَفَتَقۡنَٰهُمَاۖ وَجَعَلۡنَا مِنَ ٱلۡمَآءِ كُلَّ شَيۡءٍ حَيٍّۚ أَفَلَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٣٠﴾ وَجَعَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمۡ وَجَعَلۡنَا فِيهَا فِجَاجٗا سُبُلٗا لَّعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿٣١﴾ وَجَعَلۡنَا ٱلسَّمَآءَ سَقۡفٗا مَّحۡفُوظٗاۖ وَهُمۡ عَنۡ ءَايَٰتِهَا مُعۡرِضُونَ ﴿٣٢﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَا جَعَلۡنَا لِبَشَرٖ مِّن قَبۡلِكَ ٱلۡخُلۡدَۖ أَفَإِيْن مِّتَّ فَهُمُ ٱلۡخَٰلِدُونَ ﴿٣٤﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٣٥﴾

(١٨) بەڵكو حەق‌و راستیمان رەوانە كردو دەیدەین بە سەری ناحەقی‌و ناڕەواییدا، جا لە كەللەی ناڕەوا دەدات، ئینجا ئەویش كتوپڕ لەناوی دەچێت‌و دەپوكێتەوەو نامێنێ، وە بۆ ئێوەش ئەی موشریك‌و خوا نەناسەكان هاوارو دادو وەیل هەیە لەو وەسفە ناڕەواو خراپانەی كە بەرامبەر بە پەروەردگار دەیڵێن.

(١٩) جا ئەوەی كەلە ئاسمانان‌و زەویدا هەیە هەر بۆ (ﷲ)یەو هەموی موڵكی ئەوە، جا موڵكایەتی‌و هاوسەری و ئەولاد دژی یەكترن، وە ئەوانەی كە لەلای (ﷲ)ن ، واتە: فریشتەكان هەرگیز خۆ بەگەورە ناگرن‌و لانادەن لەبەندایەتی ئەو زاتەو ماندو نابن، جا بەندەگەلی ﷲ چۆن دەگونجێ منداڵی ئەو زاتە بن؟! ئەوانە بەندەیانێكن كە لە بەندایەتی ﷲ لانادەن‌و ماندو نابن .

(٢٠) بە بەردەوامی شەوو رۆژ تەسبیحات‌ویادی ئەو زاتە دەكەن، وە لەو بەندایەتیشەدا هەرگیز نابچڕێن‌وكۆتایی ناكەن.

(٢١) ئایا ئەوان ئاوا خودایانێك لەم زەوییەدا بۆ خۆیان دادەنێن كە ئەوان بتوانن مردوان زیندو بكەنەوە؟ واتە: ئایا بێجگە لە ﷲ خودایەكی ئاوا شك دەبەن؟ ئینجا ﷲ خۆی وەڵام ئەداتەوەو دەفەرموێ:

(٢٢) ئەگەر لەم زەوی‌و ئاسمانانەدا چەند خوایەكی تر ببوایە جگە لە ﷲ بێگومان زەوی‌و ئاسمانەكان لە ناو ئەچون، جا كەوابوﷲ كە پەروەردگاری عەرشە، پاكەو دورە لەو وەسفە ناڕەواو خراپانەی كە ئەوان بۆ ئەو زاتەی دادەنێن‌و دەڵێن كە ﷲ هاوبەش‌و منداڵ‌و هاوسەری هەیە.

(٢٣) پرسیار ناكرێت لەو زاتە لەوەی كە ئەیكات چونكە خۆی پەوەردگارو دروستكەرو كار بەجێ‌و زانایە، بەڵكو ئەوانن كە پرسیاریان لێ دەكرێت. بەڵێ بەراستی ئەو زاتە پرسیاری هەمو كردەوەكان لەوان دەكات.

(٢٤) ئایا ئەوان بێجگە لەو زاتە خودایانێكی تر ئەپەرستن؟ ئەی محمدﷺ بڵێ: ئادەی بەڵگەی راستی لەسەر ئەو خودایانەتان بهێنن‌و بیسەلمێنن كە پەرەستنی ئەوانە حەق‌و رەوایە، ئاشكرایە كە هیچ بەڵگەیەكیان نیە، بڵێ: ئەوەی كە پێم وتن كە ﷲ هیچ شەریك‌و هاوبەشێكی نیە قسەی ئەم قورئانەو قسەی هەموكتێبانی پێش منە، وە ئەم قورئانە مایەی شەرەف‌و رێزە بۆ ئەو كەسەی لە گەڵ مندایەو مایەی شەرەف‌و رێزیشە بۆ باوەڕدارانی پێش من، جا ئەوەی دەستی پێ بگرێت سەربەرزو بەختیارە، بەڵام لەگەڵ ئەم هەمو بەڵگە رونانەدا زۆربەیان حەق نازانن‌و نایناسن‌و پشت تێ دەكەن‌و گوێی پێ نادەن.

(٢٥) خۆ رەوانەمان نەكردوە لە پێش تۆدا هیچ پێغەمبەرێك مەگەر وەحییمان كردبێتە لای بەوەی كە هیچ پەرستراوێكی راست نیە بێجگە لە من، دەی ئێوەش تەنها بەندایەتی بۆ من بكەن، ئینجا ﷲ هەروا درێژە بە باسی قسە ناڕەواكانی خوا نەناسان دەدات‌و دەفەرموێ:

(٢٦) جا ئەوان دەڵێن: رەحمان منداڵی هەیە، ئەو زاتە پاك وبێ نیازە لەهەمو وەسفێكی ناڕەوا بەڵكو ئەوانەی كەبە منالی خوای ئەزانن كە فریشتەكانن بەندەیانێكی رێز لێ گیراون، واتە: ئەمانە عەبدو بەندەی ئەو زاتەن نەك منداڵ، وە ئەزاتە پاكە لە وەسفانە.

(٢٧) ئەوان هەرگیز پێش ناكەون لە ﷲ بەهیچ قسەیەك، واتە: ناتوانن هیچ بڕیارێك بدەن هەتا ﷲ بڕیار نەدات، خۆ ئەوان بە فەرمانی (ﷲ) ئیش ئەكەن‌و خۆیان سەربە خۆ هیچ ئیشێك ناكەن.

(٢٨) جا ﷲ ئاگادارە بەوەی كە كردویانەو بەوەیش كە دەیكەن و ئەوان شەفاعەت ناكەن مەگەر بۆ ئەوكەسەی كە ﷲ رازی بێت لێی و ئەوان هەمیشە لە ساموو هەیبەتی ﷲ دەترسن.

(٢٩) ئەوسا هەرکام لەوان بڵێ : من خوام نەك ئەو (ﷲ)یەی کە ئێوە دەیپەرستن، جا ئەوە ئێمە تۆڵەی لێ دەسێنینو بە ئاگری دۆزەخ سزای دەدەین هەر ئاوەهاش تۆڵە دەسێنین لە ستەمکاران، ئینجا خوای باڵادەست باسی توانایو دەسەڵاتی خۆی دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٠) ئایا بێباوەڕان نابینن‌و نازانن کە بێگومان ئاسمانانو زەوی یەك پارچە بوون ئێمە لەیەك جیامان کردنەوە. بەڵێ ئاسمانانی کرد بە حەوت ئاسمانو زەویشی کرد بە حەوتو هەوای دانا لەنێوانیان داو لە ئاسمانەوە پاش ئەوەی کە بێباران بو بارانی باراند جا زەویش کە وشكو بێگژوگیا بو ئاودێری کردو بە گژوگیا نەخشاندی، جا دەفەرموێ: خۆ ئێمە ژیانو گەشانەوەی هەمو شتێکمان بە ئاوەوە بەستوەتەوە دەی ئایا هەر باوەڕ ناهێنن؟

(٣١) ئەوسا لە ناو زەویدا چیای بتەوو بەهێزمان دانا تا بىن بەهۆی ڕاگرتنی زەویو درێژەدان بەژیانی ئێوە، چونکە ئەگەر ئەو چیا بتەوانە نەبوایە زەوی وا بەهێزو ڕاوەستاو نەدەبو وە ئێمە دامان ناوە لەسەر زەویدا چەندین ڕێگەی جۆراو جۆر تا ئەوان بەهۆی ئەو ڕێگایانەوە بتوانن بەرەو مەبەستی خۆیان بڕۆن.

(٣٢) خۆ ئاسمانمان کردوە بەسەربانێکی پارێزراو لە هەڵوەرینو لەتبونو ڕوخانو دەست تێخستنی شەیتانەکان بەڵام ئەوان پشتیان لەو نیشانانەی ئەوکردوەو گوێی پێنادەنو هیچ پەندو ئامۆژگارییەکی لێ وەرناگرنو ناڵێن کێ ئەم ئاسمانگەی بەو شێوە جوانو ڕێك وپێکە دروستکردوەو ڕاگیری کردوە؟ بەداخەوە بەو مەخلوقە گرنگە خالیق نادۆزنەوە!

(٣٣) خۆ هەر ئەو زاتەیە کە شەوو ڕۆژو خۆرو مانگی دروستکردوە و هەموویان لە جێگا خولگەی تایبەتی خۆیاندا مەلەوان ئاسا دەسوڕێنەوە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٣٤) جا ئێمە پێش تۆ هیچ مرۆڤێکمان نەکردوە بە مرۆڤێکی هەمیشە زیندوو ژیانی هەمیشەییمان بە هیچ کەس نەداوە، بەڵکو هەموویان مردون جا تۆش هەروەکو ئەوانی بەڵام ئایا ئەگەر تۆ بمری ئەو کافرانەی کە چاوەڕوانی مردنی تو دەکەن‌و پێیان وایە کە بە مردنی تو کۆتای بە پەیامەکت دێت، ئەوان دەمێنێنەوە؟ نەخێر شتی وانیەوئەوانیش دەمرن.

(٣٥) هەمو گیان لەبەرێك ئەبێ تامی مردن بچەژێتو بمرێ خۆ ئێمەیش تاقی دەکەینەوە بە هەژاری و بەدەوڵەمەندی، بە تەنگانەو بەفەرەحی، بەژێر دەستەییو لاوازیو بەهێزو دەستەڵات، بە چاكو خراپ تا دەرکەوێت کێ ڕاستەو خۆگرەو کێیش ناپاکەو خۆی دۆڕاندوە، وە هەربۆلای ئێمە دەگەڕێنەوە کەوابو با کافرانوخوانەناسان دڵخۆش نەبن هەر چەند بژین هەردەبێ ئەو تامە تاڵو دژوارەی مردن بچەژن، وە ئەوەی کە پێیان دراوە هەموی بۆ تاقی کردنەوەیە، جا پێویستە موسڵمانیش ئاگای لەخۆی بێتو بزانێ کە بۆ تاقی کردنەوە هێنراوەتە سەرزەویو پاش کەمێ تر بەرەو حیسابو دادگا ئەچێت دەی با خۆی ئامادە بکات بۆ ئەو سەفەرە درێژەی کە گەڕانەوەی نیەو پەشیمان بوونەوەیش سودێکی نابێت، جا با وریا بێتو بە باوەرێکی پاکەوە لەو تاقی کردنەوانەی دنیادا کەﷲ بە سەری دا دەهینێت لەخۆشیو ناخۆشی خۆی نەدۆڕێنێت. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ:{احْفَظْ ا َ يَحْفَظْكَ احْفَظْ ا َ تَجِدْهُ تُجَاهَكَ إِذَا سَأَلتَ فَاسْأَلِ ا وَإِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِا وَاعْلَمْ أن الْأُمةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَنفَعُوكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَنفَعُوكَ إِلا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ ا لَكَ وَلَوْ اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَضُروكَ بِشَيْءٍ لَمْ يَضُروكَ إِلا بِشَيْءٍ قَدْ كَتَبَهُ ا عَلَيْكَ رُفِعَتْ الْأَقْلَامُ وَجَفتِ الصحُفُ/أ د وغ ه، صححه الالبا / چاودێری فەرمانەکانی ﷲ بکەو مەیان فەوتێنە (ﷲ)یش چاودێریو پارێزگاریت لێ دەکات چاودێری مافەکانی ﷲ بکە تا ﷲ لە سەختی دنیاو دوارۆژ دا فریات بکەوێت، جا هەر کاتێك داوا دەکەیت هەر لە ﷲ داوا بکە، وە هەر کاتێك دەوای یارمەتی دەکەیت هەر لە ﷲ داوای یارمەتی بکە، جا چاك بزانە کە ئەگەر هەمو خەڵك کۆ ببێتەوە بۆ ئەوەی کە سودێکت پێ بگەیەنن هیچ سودێکت پێ ناگەیەنن مەگەر هەر ئەوە نەبێت کە ﷲ بۆ تۆی نوسیبێت، وە ئەگەر هەموویان کۆببنەوە بۆ ئەوەی زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن هیچ زیانێکت پێ بگەیەنن مەگەر ئەوە نەبێت کەﷲ بۆی نوسیویت قەڵەمەکان هەڵگیرانو نوسینی سەرنجامەکانو بڕیارەکان کۆتایی پێهاتو پەڕەکانیش وشك بونەوەو تازە ئیتر هیچیان لێ نانوسرێت}

واتە: هەمو بونەوەر لە ناو دەریای تەقدیری تۆمارکراودا دە سوڕێتەوە، ئەمە بەڵگەی کەمالی عیلمی (ﷲ)یەو هیچ زۆرەملیو ئیجبارێك لەکاردانیە، ژیربەو باش لەمە تێبگە چونکە بەشێکی گرنگی بیرو باوەڕتە.

وَإِذَا رَءَاكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِي يَذۡكُرُ ءَالِهَتَكُمۡ وَهُم بِذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٣٦﴾ خُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ مِنۡ عَجَلٖۚ سَأُوْرِيكُمۡ ءَايَٰتِي فَلَا تَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٣٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٣٨﴾ لَوۡ يَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ حِينَ لَا يَكُفُّونَ عَن وُجُوهِهِمُ ٱلنَّارَ وَلَا عَن ظُهُورِهِمۡ وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٣٩﴾ بَلۡ تَأۡتِيهِم بَغۡتَةٗ فَتَبۡهَتُهُمۡ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ رَدَّهَا وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدِ ٱسۡتُهۡزِئَ بِرُسُلٖ مِّن قَبۡلِكَ فَحَاقَ بِٱلَّذِينَ سَخِرُواْ مِنۡهُم مَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٤١﴾ قُلۡ مَن يَكۡلَؤُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ مِنَ ٱلرَّحۡمَٰنِۗ بَلۡ هُمۡ عَن ذِكۡرِ رَبِّهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٢﴾ أَمۡ لَهُمۡ ءَالِهَةٞ تَمۡنَعُهُم مِّن دُونِنَاۚ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَ أَنفُسِهِمۡ وَلَا هُم مِّنَّا يُصۡحَبُونَ ﴿٤٣﴾ بَلۡ مَتَّعۡنَا هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ طَالَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡعُمُرُۗ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَنَّا نَأۡتِي ٱلۡأَرۡضَ نَنقُصُهَا مِنۡ أَطۡرَافِهَآۚ أَفَهُمُ ٱلۡغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾

(٣٦) جا کەئەوانەی کە بێباوەڕ ن هەر کاتێك تۆ دەبینن گاڵتەت پێ دەکەن وبەسوك تەماشات دەکەنو دەڵێن: ئایا ئەمەیە ئەو کەسە کەوا بە خراپی باسی خواکانتان ئەکات؟ وە هەر ئەوانن کە بێباوەڕن بەم قورئانەوبە یادی ئەو زاتە بەرەحمو میهرەبانە، جا بەڕاستی هەر ئەوانن بێ نرخو سوكو گاڵتە پێکراو نە تۆ ئەی محمدﷺ .

(٣٧) مرۆڤ دروستکراوێکی بە پەلەیەو هەمیشە دەیەوێ زوو ئاواتو ئامانجەکانی بێتەدی، جا باوەڕداران ئەیانەوێت زوو پەروەردگار تۆڵە لە بێباوەڕان وەرگرێتو سزایان بداتو بێباوەڕانیش بە پەلەن لە هاتنی ئەونیشانەو بەڵێنانەی کە پێیان دراوەو دەڵێن: ئەگەر ئەو بەڵێنانە راستە دەی با زوو بێتە دی، بەم زوانە منیش نیشانەکانی خۆم پیشانی ئێوە دەدەم کەوابو زۆر پەلە مەکەن، چونکە هەر دێتو پەلەی ناوێت بەڵام هەموشت لەلای ﷲ کاتی دیاری کراوەو تاکاتی خۆی نەیەت ئەوشتە روونادات. هەندێك ﴿ عَجَلٍ ﴾ بەقوڕ مانا کردوە، واتە: مرۆڤمان لەقوڕ دروستکردوە.

(٣٨) وە دەڵێن: کەی ئەو بەڵێنە دێتەجێ ئەگەر راست ئەکەن؟(ﷲ)یش ئەفەرموێ:

(٣٩) ئەو کەسانەی کە کافرو خوا نەناسن ئەگەر بزانن بەو کاتەی کەواناتوانن ئاگر لە دەمو چاویانولە پشتیان لابدەنو خۆیانی لێ رزگار بکەن لە کاتێکدا کە ئەوان یارمەتیش نادرێنو کەسیش بە هاواریانەو نایەت، لەدنیادا قسەی ئاوایان نەدەکرد، ئەوان داوای هاتنی سزا دەکەن نەك لەبەر زرنگیان بەڵکو لەبەر ئەوەی کەباوەڕیان بەو هەڕەشانە نییە!

(٤٠) بێگومان بەکتوپڕی سزایان بۆ دێت، جا ئەو کاتە ماتو سەرگەردانیان ئەکات، ئیتر ئەو کاتە ناتوانن ئەو سزایە کە هات بیگەڕێننەوەو لە دەستی رزگار ببن خۆ ماوەیشیان پێ نادرێت تا بیر لە چارەسەرییەك بکەنەوە، ئینجا خوای میهرەبان بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:

(٤١) خۆ بێگومان گاڵتەکراوە بە پێغەمبەرانی پێش تۆش‌و بەسوك تەماشا کراون، جا بۆ ئەوکەسانەی کە گاڵتەیان کردوە بە پێغەمبەران، ئەوسا ئەو سزایەی کە گاڵتەیان پێدەکرد هات بە سەریانداو تۆڵەی ئەو گاڵتە پێکردنانەیان لێ وەرگیرا. جا ئەمە هەروەك دڵدانەوەی پێغەمبەرمانەﷺ هەڕەشەیشە لە بێباوەڕانی گاڵتەکەر بە پێغەمبەرﷺو ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

(٤٢) ئەی محمدﷺبڵێ: کێ بە شەوو بەرۆژ دەتان پارێزێ لە سزای رەحمان بێجگە لە میهرەبانیو پاراستنی خۆی نەبێت؟ جا ئەوە بەجێی خۆی، خۆ بێگومان ئەوان پشتیان کردوتە پەڕاوو یادی پەروەردگاریانەوەو کۆتا نایەن لەو لارەملیو پشت تێکردنە.

(٤٣) ئایا بۆئەوان خوایانێك هەیە کە بیانپارێزێو یارمەتیان بدات جگە لە ئێمە؟ نەخێر، بێگومان ئەوانە ناتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن، وە لەلایەن ئێمەوە یارمەتی نادرێنو نا پارێزرێن، واتە: نەخۆیان پێیان دەکرێت و نە ئێمەش یارمەتیان دەدەین، ئینجا ﷲ هۆی سەرکەشی بێباوەڕان باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٤) بەڵکو ئەوانو باوو باپیرانیانمان لەنازو نیعمەتی خۆماندا ژیاند تا تەمەنێکی درێژیان کردو ماوەیەکی زۆر هات بە سەریانداو وایان دەزانی کە خۆیان شیاوی ئەو نازو نیعمەتەن، بۆیە پێیان دراوە، ئایا هەر لەسەر ئەو بۆچونە هەڵەیە ئەڕۆنو بیر لەئاکامی خۆیان ناکەنەوە، ئایا ئەوان نابینن کە بێگومان ئێمە کەم کەم زەوییان لێ کەم ئەکەینەوەو کۆمەڵ بە کۆمەڵ خەڵکی ئەم زەوییە دەمرێنینو لە ئەنجام دا هیچ گیانلەبەرێکی تێیدا نامێنێتەوە؟ جا هەموی هەر بۆ ﷲ دەمێنێتەوە، یان بەسەرکەوتنی تۆ بەسەر شارو دێهاتەکانی دەوروبەریان دا زەوییان لێ کەم دەکەینەوەو تەنگی دەکەین لێیان، ئایا ئەوان سەرکەوتو؟ واتە: ئەگەر ژیر بن هەر ئەمە بەسە بۆیان کە بیر بکەنەوەو لە دژایەتی (ﷲ)و پێغەمبەرەکەی واز بهێنن.

قُلْ إِنَّمَآ أُنذِرُكُم بِٱلْوَحْىِ ۚ وَلَا يَسْمَعُ ٱلصُّمُّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا مَا يُنذَرُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَئِن مَّسَّتْهُمْ نَفْحَةٌ مِّنْ عَذَابِ رَبِّكَ لَيَقُولُنَّ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَضَعُ ٱلْمَوَٰزِينَ ٱلْقِسْطَ لِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْـًٔا ۖ وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا ۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ﴿٤٧﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ٱلْفُرْقَانَ وَضِيَآءً وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَهُم مِّنَ ٱلسَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَهَٰذَا ذِكْرٌ مُّبَارَكٌ أَنزَلْنَٰهُ ۚ أَفَأَنتُمْ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٥٠﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَآ إِبْرَٰهِيمَ رُشْدَهُۥ مِن قَبْلُ وَكُنَّا بِهِۦ عَٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا هَٰذِهِ ٱلتَّمَاثِيلُ ٱلَّتِىٓ أَنتُمْ لَهَا عَٰكِفُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا لَهَا عَٰبِدِينَ ﴿٥٣﴾ قَالَ لَقَدْ كُنتُمْ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمْ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٥٤﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا بِٱلْحَقِّ أَمْ أَنتَ مِنَ ٱللَّٰعِبِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ بَل رَّبُّكُمْ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ٱلَّذِى فَطَرَهُنَّ وَأَنَا۠ عَلَىٰ ذَٰلِكُم مِّنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٥٦﴾ وَتَٱللَّهِ لَأَكِيدَنَّ أَصْنَٰمَكُم بَعْدَ أَن تُوَلُّوا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٧﴾

(٤٥) ئە محمدﷺبلێ: من پێغەمبەرێکم هەر بە هۆی ئەم قورئانەوە کە وەحی کراوەتە لام دەتانترسێنم لە سزای(اللَّهُ)و شتێکم لە لایان خۆمەوە پێ نەوتوون خۆ ئەوانەی کە کەڕن، هەرکاتێك کە ئامۆژگاری بکرێنو بترسێنرێن گوێیان لەم بانگەوازە نابێت. واتە ئەمانە خۆیان کەڕدەکەن تانەبیسن؟!

(٤٦) قەسەم بێت ئەگەر ئەوان لەلایەن پەروەردگارتەوە یەك کەم سزایان پێ بگات بێگومان کە دەڵێن: وای بۆ ئێمە چیمان بە خۆمان کرد بێگومان کە ئێمە ستەمکار بوین جا بەم شێوەیە دان بە ستەمی خۆیان دا دەنێن.

(٤٧) خۆ ئێمە میزانەکانی دادپەروەری لە رۆژی قیامەتدا دادەنێین جا هیچ کەسێك هیچ ستەمێکی لێناکرێتو ئەو کارانەی کە دەیکەن لە چاكو خراپ ئەگەر بە ئەندازەی تۆیی خەرتەلەیەك بێت دەیهێنینەوە بۆ لێ کۆڵینەوەو حیساب، وە بەسە کە ئێمە حسابکەری کردارەکان بین، چونکە هەموی دەزانینو هیچمان لێ ون نابێتو ستەمیش لە کەس ناکەین. دایکی باوەڕداران عایشە دەڵێت: پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺو وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ من هەندێك کۆیلەم هەیە کە درۆم لەگەڵدا دەکەنو خیانەتم پێدەکەنو لە قسەم دەردەچن جا بۆیە منیش لێیان دەدەمو قسەیان پێدەڵێم دەی حیسابی منو ئەوان چۆنە؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرموی: {يُحْسَبُ مَا خَانُوكَ وَعَصَوْكَ وَكَذَبُوكَ وَعِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِمْ كَانَ كَفَافًا لَا لَكَ وَلَا عَلَيْكَ وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ دُونَ ذُنُوبِهِمْ كَانَ فَضْلًا لَكَ وَإِنْ كَانَ عِقَابُكَ إِيَّاهُمْ فَوْقَ ذُنُوبِهِمْ اقْتُص لَهُمْ مِنْكَ الْفَضْلُ

/الترمذي، صححه الالبا / واتە: ئەو خیانەتەی کە پێیانکردویتو ئەوسەرپێچیەی لە فەرمانی تۆیانکردوەو ئەودرۆیانەی لەگەڵ تۆدا کردویانەو ئەو تۆڵەیش کە تۆ لە ئەوانت وەرگرتوە حیساب دەکرێت جا ئەگەر تۆڵەی تۆ لەوان بەئەندازەی تاوانی ئەوان بێت ئەوە نەقازانجو نە زەرەرت لەسەر نیەو وەك یەکیکیان لێهاتوە بەڵام ئەگەر تۆڵەی تۆ لەوان لە تاوانی ئەوان کەمتربێت ئەوە زیادەیەکەو بۆت، بەڵام ئەگەر تۆڵەی تۆ لەوان لە تاوانی ئەوان زۆرتربێت ئەوە تۆڵەی ئەوزیادەیەت بۆئەوان لە تۆ وەردە گیرێتەوە}، جا پیاوەکە دەستی کرد بە گریانو پێغەمبەریش ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە پاشان پیاوەکە وتی: باشترین شت بۆ ئەوانو بۆ من ئەوەیە کە لەیەکتر جیا بین جا شایەت بن کە من هەمویانم ئازاد کرد.

(٤٨) بەحەقیقەت ئێمە (تەورات)مان دا بە موساو هارون کە جیاکەرەوەی حەقو ناحەقو روناکیو ئامۆژگاریە بۆ پارێزکاران. جا ئەو پارێزکارانە کێن؟

(٤٩) ئەو کەسانەن کە لە پەنامەکیدا لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن، وە ئەوانە لە رۆژی قیامەت دەترسن چونکە ئەزانن ئەو رۆژە چەند سەختوپڕ مەترسیە.

(٥٠) ئەوسا ئەم قورئانەی کە ناردومانە ئامۆژگاریکەرێکی پیرۆزە ئایا ئێوە نکولی دەکەنو نمەك نەناسن؟

(٥١) جا بە حەقیقەت ئێمە هەر لە پێشدا ئەوەی کەراستو دروستبو لەبیرو بۆچونی یەکخواپەرستی پاكوخاوێن بە ئیبراهیممان بەخشیوتێمان گەیاند کەچی بکات، وە ئێمە باشمان دەناسیو بە شایستەیی ئەم ئەرکە قورسەمان دەزانی.

(٥٢) دەی بیریان بخەرەوە ئەو کاتەی کە بە باوکی وت: ئەم پەیکەرانە چین کە ئێوە مل کەچن بۆیانو لە بەردەمیاندا خۆتان متکردوەو دەیان پەرستن؟

(٥٣) وتیان: ئێمە باوکانی خۆمانمان دیوە کە بەندایەتی ئەمانەیان دەکردو دەیان پەرەستن. واتە، پەرستنێکی کوێرانەیەو نایانەوێ کەوازی لێ بهێنن؛

(٥٤) ئیبراهیم وتی: بەحەقیقەت ئێوەو باوکانیشتان لە گومراهی ئاشکرا دان.

(٥٥) ئەوانیش وتیان: ئەوە تۆ لە راستیتە؟ ئایا تۆ هیچ راستیەکت هێناوە بۆمانو هیچت بە دەستەوەیە یان لە دەسبڕو گاڵتەچییانی؟

فَجَعَلَهُمْ جُذَاذًا إِلَّا كَبِيرًا لَّهُمْ لَعَلَّهُمْ إِلَيْهِ يَرْجِعُونَ ﴿٥٨﴾ قَالُوا مَن فَعَلَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا إِنَّهُ لَمِنَ الظَّالِمِينَ ﴿٥٩﴾ قَالُوا سَمِعْنَا فَتًى يَذْكُرُهُمْ يُقَالُ لَهُ إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٠﴾ قَالُوا فَأْتُوا بِهِ عَلَىٰ أَعْيُنِ النَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَشْهَدُونَ ﴿٦١﴾ قَالُوا أَأَنتَ فَعَلْتَ هَٰذَا بِآلِهَتِنَا يَا إِبْرَاهِيمُ ﴿٦٢﴾ قَالَ بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُمْ هَٰذَا فَاسْأَلُوهُمْ إِن كَانُوا يَنطِقُونَ ﴿٦٣﴾ فَرَجَعُوا إِلَىٰ أَنفُسِهِمْ فَقَالُوا إِنَّكُمْ أَنتُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٦٤﴾ ثُمَّ نُكِسُوا عَلَىٰ رُءُوسِهِمْ لَقَدْ عَلِمْتَ مَا هَٰؤُلَاءِ يَنطِقُونَ ﴿٦٥﴾ قَالَ أَفَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنفَعُكُمْ شَيْئًا وَلَا يَضُرُّكُمْ ﴿٦٦﴾ أُفٍّ لَّكُمْ وَلِمَا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴿٦٩﴾ وَأَرَادُوا بِهِ كَيْدًا فَجَعَلْنَاهُمُ الْأَخْسَرِينَ ﴿٧٠﴾ وَنَجَّيْنَاهُ وَلُوطًا إِلَى الْأَرْضِ الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا لِلْعَالَمِينَ ﴿٧١﴾ وَوَهَبْنَا لَهُ إِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ نَافِلَةً ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا صَالِحِينَ ﴿٧٢﴾

(٥٦) ئیبراهیم وتی: نەخێر وا نیە کە ئێوە دەیڵێن، بەڵکو من ڕاستیم بۆ ئێوە هێناوەو ئەمانە پەروەردگاری ئێوە نیین، بەڵکو پەروەردگاری ئێوە، هەرئەو پەروەردگارەی ئاسمانان‌و زەوییەکە دروستیکردون‌و من لە سەر ئەوەی کە وتم یەکێکم لە شایەتەکان.

(٥٧) قەسەم بەاللە ﷻ پاش ئەوەی کە پشتان تێ کردن‌و ڕۆیشتن من فێڵێك بەو بتانەی ئێوە دەکەم. بەڵێ ئیبراهیم بۆ هەڵێك ئەگەڕا بۆ هێنانەدی سوێندەکەی‌و هەمو ڕۆژێك لەبیری ئەوەدا بو تا کاتی جەژنێکیان هات، جا باویان وابو کە دەچونە دەرەوەو داوایان لە ئیبراهیمش کرد کە لە گەڵیان بچێت بەڵام ئیبراهیم وتی: من نەخۆشم‌و نایەمە دەرەوە، جا کاتێ چونە دەرەوە هاتە لای بتەکان‌و بەگاڵتە پێکردنەوە پێی وتن: ئەوە بۆ هیچ ناخۆن، ئەوە بۆ قسە ناکەن ئینجا بە تەور هات بە وێزەیان دا.

(٥٨) جا هەموویانی پارچە پارچەکرد بێجگە لە بتە گەورەکەیان‌و تەورەکەی لەسەر شانی داناو هاتە دەرەوە، بەو هیوایە کەئەوان بگەڕێنەوە بۆلای‌و لەبێ دەنگی‌و بێ دەسەڵاتی خواکانیان تێبگەن، پاشان گەلەکەی لە جەژنەکەیان گەڕانەوەو دییان کە خواکانیان خراپیان بەسەرهاتوەو لەتو پەت کراون.

(٥٩) وتیان: کێ وای کردوە بە خواکانمان؟ بێگومان ئەو کەسەی ئاوای لە خواکانمان کردوە لە ستەمکارانەو ستەمی لە خواکانمان کردوە! جا بزانن کێیەو پەیدای بکەن، هەندێکیان کە قسەکانی ئیبراهیمیان لە بیر بو.

(٦٠) وتیان: بیستومانە لاوێك بەخراپە ناویانی دەبرد کە ئیبراهیمیان پێ دەوت.

(٦١) جا پاشا و پیاو ماقوڵانیان‌وتیان: بچن بەناو خەڵکا بیهێنن بەڵکو کەسانێك هەبن چاویان پێ کەوتبێ‌و شایەتی لەسەر بدەن‌و ئامادەی دادگایی‌و سزادانەکەی ببن، ئەوانیش چون‌و بەناو خەڵکا هێنایان‌و کەس شایەتی لەسەر نەداو بردیانە بەردم پاشاو دارو دەستەکەی، جا کەوتنە لێ کۆڵینەوە لەگەڵ ئیبراهیم دا.

(٦٢) وتیان: ئەی ئیبراهیم تۆ ئاوەهات کردوە بە خواکانی ئێمە؟

(٦٣) ئیبراهیم وتی: وانیە کە ئێوە بۆی دەچن هەرکەس کردوویەتی، ئەوە گەورەکەیانەو تەوری بەشانەوەیە، دەی پرسیاریان لێ بکەن ئەگەر قسە ئەکەن با پێتان بڵێن چی قۆماوەو کێ ئەم ئیشەی کردوە، ئیبراهیم بەم وتە کورت‌و جوانەی هەژاندنی‌و هێنانیەوە سەرخەتی ڕاست، وەك دەفەرموێ:

(٦٤) ئینجا کافرەکان لەم کاتەدا هاتنە سەر پرسیار لە خۆیان‌و زانیان کە ئەمانە شیاوی پەرستن، نین جا خۆیان بە خۆیان وت: بێگومان ئێوە ستەمکارن، چۆن ئەبێ شتێ بپەرستین کە نە دەتوانێت پارێزگاری لە خۆی بکات‌و نە دەتوانێت قسەیەك بکات؟! بەڵام شەیتان هەڵی خەڵەتاندن‌و چونەوە سەر کلتوری کۆنیان، وەك دەفەرموێ:

(٦٥) لە پاشان پاشگەز بونەوەو گەڕانەوە بۆسەر کوفرو فەسادەکەی خۆیان، ئینجا ڕویان کردە ئیبراهیم‌و وتیان: تۆ چاك دەزانی کە ئەمانە قسە ناکەن تۆ چۆن بە ئێمە ئەڵێیت پرسیاریان لێ بکەن؟ ئینجا ڕێگای قسە بۆ ئیبراهیم خۆش بو،

(٦٦) وتی: ئایا ئێوە بەندایەتی شتانێك جگە لە اللە دەکەن کە نە هیچ سودێکتان پێ ئەگەیەنن‌و نە هیچ زیانێك، دەی ئیتر ئەبێ بۆچی بەندایەتیان بۆ بکەن؟

(٦٧) بێ نرخی‌و سوکایەتی بۆ ئێوەو ئەوانەش کە جگە لە اللە دەیان پەرستن کە چەند سەرلێشێواون، دەی ئایا ئێوە عەقڵتان نییە کە بیر بکەنەوەو ڕاست‌و ناڕاست لەیەك جیا بکەنەوە؟ جا ئەوان لەباتی بیرکردنەوەو بەخۆداچون وباوەڕهێنان بە خوای بێ وێنەو تاك‌وتەنیا.

(٦٨) بە خەڵکیان وت: بیسوتێنن‌و یارمەتی خواکانتان بدەن‌و تۆڵەیان لە ئیبراهیم وەرگرن ئەگەر ئەتانەوێ خزمەتێك

بەخواكانتان بكەن، بەڵێ ئیبراهیم ئاگرێكی گەورەی بۆكرایەوەو خستیانەناویەوە خوایش دەفەرموێ:

(٦٩) وتمان: ئەی ئاگر سارد ببە، بەڵام نەك ساردێكی وا كە رەق ببێتەوە بەڵكو بێ زیان بیت بۆ ئیبراهیم.

(٧٠) جا ئەوان ویستیان فرِوفێڵێكی گەورە بكەن بە ئیبراهیم‌و ویستیان بیسوتێنن، وە ئێمەش ئەو فرِوفێڵەی ئەوانمان هەڵوەشاندەوەو ئیبراهیمیمان رزگار كرد. جاپاش چەند رۆژێك لەناو ئاگردا ئیبراهیم بەبێ زیان هاتەدەرەوە.

(٧١) ئەوسا ئیبراهیم‌و لوتمان رزگار كردو رەوانەمان كردن بەرەو ئەو زەوییەی كە هۆی خێرو خۆشی بو بۆ هەمو خەڵكی ئەو سەردەمە كە زەوی شام بوو، دەڵێن ئەم روداوەی ئیراهیم لە عێراقدا بووەو لە پاشدا ﷻ وای ویستوە كە لەگەڵ لوتی برازایدا بچێ بۆ شام، جا پەروەردگاری عالەم زیاترخەڵاتی كردو لەسەردەمی پیریدا هات بەهانایەوەو دوو كوڕی پیدا، وەك دەفەرموێ:

(٧٢) جا بەخشیمان بە ئیبراهیم ئیسحاق، وە بە ئیسحاقیش یەعقوب كە زیادەیەك بو كرا بەخەڵاتی ئیبراهیم وە هەموویانمان كرد بە پیاو چاك و دروست كردار. ناوی ئیسحاق پێغەمبەر حەفدە جار و ناوی یەعقوبی كوڕی شانزە جارلە قورئاندا هاتوە.

(٧٣) ئەوسا ئیمە ئەوانمان كرد بە پێشەوایانێك كە بەگوێرەی فەرمانی ئێمە خەڵكیان رێنمای دەكرد، جا وەحیمان كردە لای ئەوان بە كردنی ئیشی چاكو بەجێهێنانی نوێژو بە دانی زەكات، وە بە دڵنیاییەوە كە ئەوان گەردنكەچو بەندەی راستی ئێمە بون، ئەمە هەمو لە پاداشتی پاكو خاوێنی ئیبراهیم دا بو، كە پەروەردگاری بێنیازو میهرەبان پێی بەخشین، ئینجا بە شێوەیەكی كورت باسی لوت دەكاتو دەفەرموێ :

(٧٤) وە بە لوتیش حیكمەت وعیلمان بەخشی‌و كردمان بە پێغەمبەر، وە ئەویشمان رزگار كرد لەو گوندەی كەوا ئیشە قێزەونە پیسەكانیان دەكرد، بێگومان ئەوان گەلێكی خراپبون‌و دەرچووو بون لە سنوری ﷻ.

(٧٥) جا ئەومان رزگار كردو خستمانە ناو سۆزو رەحمەتی خۆمانەوە، بێگومان ئەو لە پیاو چاكان بو، ئینجا باسی نوحیش دەكاتو دەفەرموێ:

(٧٦) دەی باسی نوح بكە ئەو كاتەی لە پێش ئیبراهیم‌و لوت دا كە هاواری لێ كردین‌و وتی: ئەی پەروەردگارم من شكستم خواردووەو ئەوان زاڵن بەسەرمدا تۆڵەم بۆ بستێنەوەو یارمەتیم

وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِمۡ فِعۡلَ ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَإِقَامَ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءَ ٱلزَّكَوٰةِۖ وَكَانُواْ لَنَا عَٰبِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَلُوطًا ءَاتَيۡنَٰهُ حُكۡمٗا وَعِلۡمٗا وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلَّتِي كَانَت تَّعۡمَلُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَٰسِقِينَ ﴿٧٤﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٧٥﴾ وَنُوحًا إِذۡ نَادَىٰ مِن قَبۡلُ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَأَهۡلَهُۥ مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٧٦﴾ وَنَصَرۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمَ سَوۡءٖ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٧٧﴾ وَدَاوُۥدَ وَسُلَيۡمَٰنَ إِذۡ يَحۡكُمَانِ فِي ٱلۡحَرۡثِ إِذۡ نَفَشَتۡ فِيهِ غَنَمُ ٱلۡقَوۡمِ وَكُنَّا لِحُكۡمِهِمۡ شَٰهِدِينَ ﴿٧٨﴾ فَفَهَّمۡنَٰهَا سُلَيۡمَٰنَۚ وَكُلًّا ءَاتَيۡنَا حُكۡمٗا وَعِلۡمٗاۚ وَسَخَّرۡنَا مَعَ دَاوُۥدَ ٱلۡجِبَالَ يُسَبِّحۡنَ وَٱلطَّيۡرَۚ وَكُنَّا فَٰعِلِينَ ﴿٧٩﴾ وَعَلَّمۡنَٰهُ صَنۡعَةَ لَبُوسٖ لَّكُمۡ لِتُحۡصِنَكُم مِّنۢ بَأۡسِكُمۡۖ فَهَلۡ أَنتُمۡ شَٰكِرُونَ ﴿٨٠﴾ وَلِسُلَيۡمَٰنَ ٱلرِّيحَ عَاصِفَةٗ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦٓ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۚ وَكُنَّا بِكُلِّ شَيۡءٍ عَٰلِمِينَ ﴿٨١﴾

بدە، جا ئێمەش وڵاممان دایەوەو خۆی‌و پەیڕەوانی‌و خانەوادەكەی جگە لە كوڕێكی لەو تەنگانەو ناڕەحەتیە سەختەی كە تێیدا بون رزگارمان كردن.

(٧٧) ئەوسا یارمەتی ئەوانمان داو رزگارمان كردن لەناو ئەو گەلەی كە بێباوەڕبون بە نیشانەكانی ئێمە، بێشك كە ئەوان گەلێكی خراپ بون جا ئێمەش هەمومان بەئاو خنكاند، ئینجا باسی داودو سلیمانی كوڕی دەكاتو دەفەرموێ:

(٧٨) جا باسی داودو سلێمان بكە ئەو كاتەی كە حوكمیان كرد لە بارەی كێڵگەیەكەوە كاتێ كە مەڕو ماڵاتی گەلێك شەوتێیدا بلاوبونەوەو خواردیان، وە ئێمە ئاگاداری بڕیارەكانیان بوین.

وشەی ﴿نَفَشَتۡ﴾ تەنها بۆ كاتی شەو بەكاردێت، واتە: شەو ئەو مەڕو ماڵاتە چونە ناو ئەو كێڵگەوەو خواردبویان دەڵێن باخێكی ترێ بو كە شەو ئەو حەیوانانە چونەتە ناوی‌و هەمو هێشوە ترێكانیان خراپ كردبو، جا خاوەن كێڵگەكەو خاوەن مەڕو ماڵاتەكە هاتن بۆلای داود كە لە نێوانیان دا بڕیار بدات ئەویش بڕیاریدا كە حەیوانەكان بدرێ بەخاوەنی باخەكە، وە سلێمانی كوڕی: وتی ئەی پێغەمبەر بڕیارێكی ترت بدایە فەرموی چۆن؟ سلێمان وتی: با مەڕو ماڵاتەكە بدەن بەو كابرایەی كە باخەكەی خوراوەو سودی لێ وەربگرێتو خاوەن حەیوانەكەش باخەكەی پێ بدرێت تا خزمەتی بكات تا ئەو كاتەی وەك خۆی لێ دێتەوە

وَمِنَ ٱلشَّيَٰطِينِ مَن يَغُوصُونَ لَهُۥ وَيَعۡمَلُونَ عَمَلٗا دُونَ ذَٰلِكَۖ وَكُنَّا لَهُمۡ حَٰفِظِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَأَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلضُّرُّ وَأَنتَ أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿٨٣﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ فَكَشَفۡنَا مَا بِهِۦ مِن ضُرّٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَا وَذِكۡرَىٰ لِلۡعَٰبِدِينَ ﴿٨٤﴾ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِدۡرِيسَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ كُلّٞ مِّنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿٨٥﴾ وَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ فِي رَحۡمَتِنَآۖ إِنَّهُم مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٦﴾ وَذَا ٱلنُّونِ إِذ ذَّهَبَ مُغَٰضِبٗا فَظَنَّ أَن لَّن نَّقۡدِرَ عَلَيۡهِ فَنَادَىٰ فِي ٱلظُّلُمَٰتِ أَن لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبۡحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٨٧﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَنَجَّيۡنَٰهُ مِنَ ٱلۡغَمِّۚ وَكَذَٰلِكَ نُـۨجِي ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَزَكَرِيَّآ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥ رَبِّ لَا تَذَرۡنِي فَرۡدٗا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٨٩﴾ فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ﴿٩٠﴾

ئینجا هەرکەسەو ماڵی خۆی، مەڕو ماڵاتەکە بۆ خاوەن مەڕو ماڵاتەکەو باخەکەش بدرێتەوە بە خاوەن باخەکە.

(٧٩) جا سلێمانمان تێگەیاند کە چۆن ئەو بڕیارە بدات، واتە: ئەو بڕیارەی سلێمان بەشێوەی وەحی بوە، بەڵام بڕیاری داودی باوکی بە ئیجتهادی خۆی بوەو اللّٰه لۆمەی نەکردوە، بەڵکو فەرموی: خۆ بە هەموویان هەم بڕیارو هەم زانیاریمان پێدا بون، واتە: هەردووکیان لەلایەن پەروەردگارەوە زانیاری حوکمە جۆراو جۆرەکانو چۆنیەتی بڕیاردان لە سەریان پێدرا بو، جا چیاکانو باڵندەکانمان ڕامو گەردنکەچ کرد بۆ داود کە لەگەڵی دا تەسبیحات بکەن، وە ئێمە ئارەزۆی هەرچی بکەین ئەیکەین. واتە خوا ئەوشتەگرنگانەی بۆ داود کرد تا خەڵکی سەردەمی خۆی باوەڕی پێبکەنو پەیڕەوی بکەن.

(٨٠) جا فێری دروستکردنی پۆشاکی زرێمان کرد بۆ سودی ئێوە تا ئەو لیباسە بتان پارێزێ لەشیرو تیری شەڕەکانتان ، دەی ئایا ئێوە سوپاسی اللّٰه دەکەن لەسەر ئەو هەمو نیعمەتانەی کە پێیداون؟ دەڵێن داود یەکەم کەس بوە کە پۆشاکی زرێی بەشێوەی هەڵقە دروستکردوە. ئینجا ئەچێتە سەرباسی سلێمانو دەفەرموێ:

(٨١) خۆ بایەکی توندی بێ شەپۆلو بێ تاسەمان ڕام وگەردنکەچ کرد بۆ سلێمان کە بەفەرمانی ئەو هاتو چۆی دەکرد بۆ ئەو خاکەی کە خێرو بەرەکەتێکی زۆرمان لە ناودا دانا بو کە زەوی شامە، ئەو بایە هەرتاقێك ماوەی مانگێك پیادەڕەوی دەبڕی.

(٨٢) جا لە ناو شەیتانەکاندا هەندێك هەبون کە ئەچونە ژێر دەریا بۆیو شتی بەنرخی ژێر دەریایان بۆ دەر دەهێناو ئیشی تریشیان بۆ دەکرد جا ئێمە چاودێریمان دەکردنولە شەڕی ئەوان دەمان پاراستن. واتە: اللّٰه شەیتانەکانی ڕام وگەردنکەچ کرد بو بۆ سلێمان و بە فەرمانی ئەو ئیشیان بۆ دەکردو نەیان دەتوانی شتێکی ناڕەوا دژ بە ئەو ئەنجام بدەن، ئینجا خوای گەورەو بە دەسەڵات باسی "ئەیوب" پێغەمبەرمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٨٣) باسی ئەیوبیش بکە ئەو کاتەی کە بانگی پەوەردگاری کردو وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان کە من دوچاری زیان بووم لە ماڵو لەلەشم دا خۆ تۆیش لە هەمو خاوەن سۆزەکان بە سۆزتری. ناوی ئەیوب چوار جار لە قورئاندا هاتوە کە وتراوە لە دەوروبەر دیمەشقدا ژیاوە،

(٨٤) جا ئێمە هاتین بە هاواریەوەو هەرچی ناخۆشییەکی هەبو لامان بردو خاوخێزانەکەیو لەگەڵ ئەوانیشدا ئەوەندەی ترمان پێدا کە ئەمە بەزەییەك بو لە لایەن ئێمەوە بۆ ئەو، چونکە ئەو بەندەیەکی خۆگربو، وە تا یاداوەریەکیش بێت بۆ ئە وانەی کە تەنها اللّٰه دە پەرستنو تەنها لەو دەپاڕێنەوە بۆ ئەوەی خۆ بگرنو تەنها بەو پشت ببەستن تا وەك ئەو پاداش بدرێنە. موسعەبی کوڕی سەعد دەڵێ: باوکم پرسیاری کرد لە پێغەمبەرﷺکە چ کەسێك گرفتاریو بەڵای دژوارترو زۆرتر بوە؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی:{الأَنبِيَاءُ ثُمَّ الأَمثَلُ فَالأَمثَلُ فَيُبتَلَى الرَّجُلُ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ فَإِنْ كَانَ دِينُهُ صُلبًا اشْتَدَّ بَلَاؤُهُ وَإِنْ كَانَ فِي دِينِهِ رِقَّةٌ ابْتُلِيَ عَلَى حَسَبِ دِينِهِ فَمَا يَبْرَحُ الْبَلَاءُ بِالْعَبْدِ حَتَّى يَتْرُكَهُ يَمْشِي عَلَى الأَرْضِ مَا عَلَيْهِ خَطِيئَةٌ/ واتە: سەخت ترین گرفتاریو زۆرترین بەڵا بەسەر پێغەمبەرانەوە بووە، پاشان ئەوانەی کە لە ئایینو ڕەوشت دا هاوشێوەی پێغەمبەران بوون، پاشان ئەوەی کە لە وانەوە نزیکن، جا هەر پیاوێك بە گوێرەی ئایینەکەی توشی بەڵاو گرفتاری دێت. ئەگەر لە ئایینەکەی دا توند بێت بەڵاو سەختیەکانی توند ترە، وە ئەگر لە ئایینەکەی دا شلوشۆڵو نەرم بو بەو گوێرەیە بە بەڵا تاقی دەکرێتەوە، جا بەڵا بە سەر بەندەدا بەردەوامە تاوای لێ دێت کە بە سەر زەوی دا دەچێت کە هیچ تاوانێکی بە سەرەوە نەماوە}

(٨٥) جا ئەی محمدﷺباسی ئیسماعیلو ئیدریس وزولکفلیش بۆ گەلەکەت بکە کە ئەوان هە مویان لە سەر بە ندایەتی اللّٰه وئێش وئازاری دنیا لە خۆگران بون. زولکفل لەم ئایەتەداو لە ئایەتی چلو هەشتی سورەتی صاد ناوی براوە، زانایان لەسەر ئەوەی کە

ئایا یەکێکە لە پێغەمبەران یان پیاوچاکێك بوە یەکیك دەنگ نین، وەهەروەها ئیدریسیش تەنها لەم ئایەتەداو لە ئایەتی پەنجاو شەشی سورەتی مریم دا ناوی براوە کە یەکێکە لە پێغەمبەران.

(٨٦) خۆ ئێمەیش ئەوانمان بەر بەزەیی و سۆزی خۆمان خست چونکە بێگومان کە ئەوان لە پیاوچاکان بون.

(٨٧) ئەوسا یادی خاوەنی ماسیش بکە ئەو کاتەی کە بە تورەیی دەرچوو لە ناو گەلەکەی و بەجێی هێشتن پێش ئەوەی کە لە لایەن خواوە فەرمانی بۆ بێت، جا گومانی وا بو کە هە رگیز ئێمە تە نگانەی بەسەردا ناهێنین لەو رۆیشتنەیدا، جا کاتێ کە سواری کە شتیەکی پڕ بو نزیك بو هەموویان نغرۆ ببن، جا بۆ ئەوەی کە کەشتیەکە باری سوك تر ببێت تیروپشکیان کرد بۆفڕەدانی یە کێکیان بو ناو دەریا، جا ئەوە بو کە ئەو دەرچو ئەوسا فڕە درایە ناو دەریاوەو ماسییەکی گەورە هەڵیلوشی، ئینجا ئەو لە ناو تاریکییەکانەوە، تاریکایی سکی ماسی، تاریکایی دەریاوتاریکایی شەو، هاواری کردو وتی: بە راستی ئەی خوایە جگە لە تۆهیچ پەرستراوێکی راست نیەو پاکی و بێ خەوشی بۆ تۆیە بە راستی من لە کۆمەڵی ناحەقان بوم، بەم شێوەیە خاوەنی ماسی (یونس) دانی بە هەڵەی خۆیدا نا سەبارت بە پەلە کردن و چاوەڕوان نەکردنی فەرمانی ﷲ ، خوای خاوەن سۆزو میهرەبانیش بە دەمیەوە هات، وەك دەفەرموێ:

(٨٨) ئەوسا ئیتر ئێمە هاتین بە دەمیەوەو لەو خەمە رزگارمان کرد، جا هەر ئاوەها چۆن یونسمان رزگار کرد لەو خەم و پەژارە سەختە هەمو باوەڕدارانیش رزگار دەکەین ئەگەر وەکوئەو دان بە هەڵەی خۆیاندا بنێن ودرێژە بە لوت بەرزی وخۆ پە سەندی نەدەن. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {فَإِنَّ الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ/متفق عليه/ واتە: ئەوسا بێگومان هەر کاتێك بەندە دانی نا بە تاوانی خۆیداو پەشیمان بویەوەو تەوبەی کرد ﷲ تەوبەی لێ وەردەگرێت} لێرەدا تەنها بەسەرهاتەکەی یونس باسدەکاتو ناوی نابات بەڵام ناوی ئەم پێغەمبەرە چوار جار لە چوار سورەتی قورئاندا ناوی هاتوە کە وتراوە کاتێك گەلەکەی خۆی بەجێهێشت بەرەو تونسی ئیستا کەوتەڕێ، جا کاتێ کە فڕەدرایە ناو ئاوەکە پەروەردگار رزگاری کردو پاشان لە نەینەوا نیشتەجێ بو، ئینجا دەفەرموێ:

(٨٩) باسی زەکەریایش بکە ئەو کاتەی کە هاواری کردە پەروردگاری و وتی: ئەی پەروەردگارم بە تەنیام مەهێڵە وکەسێکم پێبدە کە جێ نشینم بێت، وە هەر خۆتی باشترینی ئەوانەی کە دەمێننەوە، ئەمە هەم پاڕانەوەیەو هەم سوپاس

وَٱلَّتِىٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ (٩١) إِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُونِ (٩٢) وَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡۖ كُلٌّ إِلَيۡنَا رَٰجِعُونَ (٩٣) فَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٌ فَلَا كُفۡرَانَ لِسَعۡيِهِۦ وَإِنَّا لَهُۥ كَٰتِبُونَ (٩٤) وَحَرَٰمٌ عَلَىٰ قَرۡيَةٍ أَهۡلَكۡنَٰهَآ أَنَّهُمۡ لَا يَرۡجِعُونَ (٩٥) حَتَّىٰٓ إِذَا فُتِحَتۡ يَأۡجُوجُ وَمَأۡجُوجُ وَهُم مِّن كُلِّ حَدَبٖ يَنسِلُونَ (٩٦) وَٱقۡتَرَبَ ٱلۡوَعۡدُ ٱلۡحَقُّ فَإِذَا هِيَ شَٰخِصَةٌ أَبۡصَٰرُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَٰوَيۡلَنَا قَدۡ كُنَّا فِي غَفۡلَةٖ مِّنۡ هَٰذَا بَلۡ كُنَّا ظَٰلِمِينَ (٩٧) إِنَّكُمۡ وَمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ حَصَبُ جَهَنَّمَ أَنتُمۡ لَهَا وَٰرِدُونَ (٩٨) لَوۡ كَانَ هَٰٓؤُلَآءِ ءَالِهَةٗ مَّا وَرَدُوهَاۖ وَكُلّٞ فِيهَا خَٰلِدُونَ (٩٩) لَهُمۡ فِيهَا زَفِيرٞ وَهُمۡ فِيهَا لَا يَسۡمَعُونَ (١٠٠) إِنَّ ٱلَّذِينَ سَبَقَتۡ لَهُم مِّنَّا ٱلۡحُسۡنَىٰٓ أُوْلَٰٓئِكَ عَنۡهَا مُبۡعَدُونَ (١٠١)

کردنی خودایە، داوای واریس دەکات، وە هەر خوایش بە چاکترینی واریسان دەزانێ. بەڵێ پەروەردگاری دلۆڤان هات بە هانایەوە، وەك دەفەرموێ:

(٩٠) جا ئێمەش وەڵاممان دایەوەو "یەحیا"مان پێ بەخشی و ژنەکەی کە منداڵی نە دەبو بۆمان چاك کردەوە بە راستی ئەوان لە ئەنجامدانی چاکەکان زۆر بە پەلە بونو کێ بەرکێیان دەکرد، وە لە کاتێکدا کە ئومێدی لێخۆشبونو ترس لە تۆڵەیان بوو بانگیان لە ئێمە دەکردو ئێمەیان دەپەرست، وە ئەوان گەردنکەچبون بۆ بەندایەتی و فەرمانبەریمان. ئینجا باسی "مەریم"مان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

(٩١) جا باسی ئەو ئافرەتە بکە کە شەرمی خۆی پاراست بو لە خراپە، خۆ ئێمە بە هۆی فریشتەوە بەشێك لەو گیانەی کە خۆمان دەیزانین کرد بە بەریاو پاشان عیسای بو، وە خۆی وکوڕەکەیمان کرد بە نیشانەیەکی ئاشکرا بۆ هەمو خەڵکی دنیا، ئینجا دەفەرموێ:

(٩٢) بە بێگومان ئەمە ئایینی هەموتانە کە یەك ئایینە و تەنها من پەروەردگاری ئێوەم دەی ئەبێ هەرمن بپەرستن. چونکە لە بوون وپەروەردەی مرۆڤدا جگە لە خوا کەسی تر نەبوە دەی ئەگەر خۆتان گێل نەکەن چۆن دەبێ جگە لەو بپەرستن؟ بەڵام مرۆڤ کەمێکی نەبی گوێ لە فەرمانی ﷲ ناگرێ و هەمیشە لارێ وناهەقی کارە، وەك لێرەدا دەری دەخاتو دەفەرموێ:

(٩٣) جا ئەوان لە نێوان خۆیاندا کاروباری خۆیانیان بچڕ بچڕ کرد. وە هەریەکەی تەنها بەشی خۆی لاپەسەند بو بەڵام خۆ ئەمە هەر ئاوەها بێ حیسابو کیتاب ناڕوات، بەڵکو هەمویان بۆ لای ئێمە دێنەوەو بگرەو بەردە لێرە دەست پێ دەکات،

(٩٤) جا ئەوکەسەی کە لە ئیشە چاکەکان ئەنجام بدات وبە کاری خێرو باشەوە خەریك بێتو لە گەل ئەوەشدا باوەڕدار بێت جا ئەوە هەوڵ وکۆششەکەی بە فیڕو ناچێت بەڵکو بۆی تۆمار دەکەینو لەپاشە ڕۆژدا پاداشتی دەدەینەوە، دیارە مەرجی وەرگیرانی کاری چاكو دەستکەوتنی پاداشتەکەی لە دوارۆژدا بونی ئیمانو باوەڕە، وە ئەوکەسەی باوەڕی نەبێت کاری چاکی بۆ پاشە ڕۆژ سودی نابێت، بەڵێ ئەم ژیانە بۆ تاقی کردنەوەیە وپاش دەرچون لێی تازە ئاخ وداخ بۆخواردنی سودی نابێت چونکە ﷲ دەفەرموێ:

(٩٥) ئێمە خەڵکی هەر شوێنێکمان لە ناو برد تازە نابێ بگەڕێنەوە، جا ئەگەر مرۆڤ ژیری خۆی لە دەست نەداوە با بەر لەوەی بەرەو ئەودنیا پاڵ بنرێت بیر لە خۆی بکاتەوەو بزانێت لە چی دروستکراوەو بەرەو کوێ دەچێتو پاشەرۆژی چی ئەبێتو چی بۆ ئامادە کراوە.

(٩٦) تا ئەو کاتەی "یاجوج" و"ماجوج" کە لە نەوەی ئادەمو لە ئەولادی نوح لە یافیسەوە کە باوکی تورکانن دەرگایان لێ دەکرێتەوە جا ئەوان لە هەموشوێنە بەرزەکانەوە هێرش دەکەنو دێنە خوارەوە.

پاش ئەوەی کە عیسا دێتە خوارەوەو دەجاڵ لە ناو دەبات (ﷲ)ی باڵادەست بە عیسای رادەگەیەنێت کە بەندەیانێکم هێناوەتە دەرەوە کە هیچ کەس دەرەقەتیان نایەت، جا تۆ بەندەکانی من کۆکەرەوەو بیانبە بۆ چیای "تور" با لە شەڕی ئەوان لە ئەمان دا بن، جا ئەو کاتە یاجوجو ماجوج دێنە دەرو لە هەمو بەرزایەکانەوە دێنەخوارەوە، ئەمانە ئەوەند زۆرن کە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { فَيَمُرُّ أَوَائِلُهُمْ عَلَى بُحَيْرَةِ طَبَرِيَّةَ فَيَشْرَبُونَ مَا فِيهَا وَيَمُرُّ آخِرُهُمْ فَيَقُولُونَ لَقَدْ كَانَ بِهَذِهِ مَرَّةً مَاءٌ/ واتە: سەرەتای ئەوان کە دەگەیەتە دەریاچەی "تەبەرییە" ئەو ئاوەی کە تێیدایە دەیخۆنەوە، جا کاتێك کە ئاخرەکەیان بەو دەریاچەیە دەگەیەت دەڵێت زەمانێك ئەمە ئاوی تێدابوە} ئینجا دێنو گەمارۆی عیساو یارەکانی دەدەن ئەوسا ﷲ هەمویان لەناو دەبات، عیساو یارەکانی بۆ ماوەیەك لەو زەویە پڕخەیرو بەرەکەتەی ئەو کاتە دەمێنێنەوە پاشان ﷲ بایەك دەنێرێت کە بە هۆی ئەوەوە ئەوەی کە باوەڕدارو موسڵمانە دەمرێتو خراپ ترینی خەڵك دەمێنێنەوە کە پێغەمبەرﷺ لەبارەیانەوە دەفەرموێ:

{يَتَهَارَجُونَ فِيهَا تَهَارُجَ الْحُمُرِ فَعَلَيْهِمْ تَقُومُ السَّاعَةُ/متفق عليه/ ئەوانە هەر وەك گوێدرێژەکان بە بێ شەرمیەوە لەیەك هەڵدێن جا قیامەت بەسەری ئەوان دا دێت}

(٩٧) خۆ ئەو بەڵێنە راستە کە هاتنی قیامەتە نزیك بوەتەوە جا ئەوکاتە بەکتوپڕی چاوی کافران هەوڵەق دەبێت ودەڵێن: بەراستی لەبێ ئاگاییەکی خراپ دا بوین بەڵکو ئێمە گەلێکی ستەمکاربوین، ستەممان لەخۆمان وخاوخێزان وخەڵکی دنیا کرد وا ئیستا بەم رۆژە رەشە گەیشتین.

ئینجا ﷲ گۆشەیەك لە سزای ئەوتاوانبارانە باس دەکات ودەفەرموێ:

(٩٨) بە راستی ئێوەو ئەوەی کە جگە لە ﷲ دەیپەرستن هەموتان دارو چیلکەی هەڵگیرێنەری ئاگری دۆزخن، چونکە بێگومان ئێوە دەچنە ناویەوەو بەو ئاگرە سەختە دەسوتێنرێن.

(٩٩) جا ئەگەر ئەوانە خودا بونایە نەدەچونە ناو ئەو ئاگرەوە. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {يَجْمَعُ اللهُ النَّاسَ فَيَقُولُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ شَيْئًا فَلْيَتَّبِعْهُ فَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الشَّمْسَ وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الْقَمَرَ وَيَتَّبِعُ مَنْ كَانَ يَعْبُدُ الطَّوَاغِيتَ/ مسلم/ رۆژی قیامەت ﷲ هەمو خەڵك کۆ دەکاتەوە، ئینجا دەفەرموێ: هەر کەس هەرچی پەرەستوە با دوای بکەوێت، ئەوسا هەرکەس خۆری پەرستوە دەکەوێتە شوێنیو هەرکەس مانگی پەرستوە شوێنی دەکەوێتو هەرکەس ملهوڕانی پەرستوە شوێنیان دەکەوێتو هەمویان بەرەو ئاگر دەچن}

واتە: هەر کەس جگە لە (ﷲ)ی پەیڕەوی کردوە لە رۆژی قیامەت دا پێی دەوترێت ئیستایش بکەوەرە شوێنی، دیارە هەندێ لە پەرستراوەکان بێ گیان وبێ دەسەلات بوون وەك بتەکانو سەروەتو سامانو پلەومەقام، جا یان ئەوانە لەو گشتییە بەدەرن یان جۆرێکیان لێ دەکرێت کە لەوێ بیانسانەوە کە ها ئەوانەش کە چاوەڕانی شەفاعەتیان لێ دەکردن وا ئیستا فڕە دەدرێنە ناوئاگرەوە تا زیاتر داخو خەفەت بخۆنو بە تەواوی نائومێد ببن،

(١٠٠) لەوێدا لە داخ وئێش وئازاردا هەر پیش دەخۆنەوەو ئاهو هەناسەی سەخت هەڵدەکێشن وهیچ نابیسن، چونکە بەکوێری ولاڵی وکەڕی حەشر دەکرێن. بەڵێ هەندێ لەو پەرستراوانەیش چاك وبێ تاوانن وەك عێساو عوزەیرو فریشتەکانو پیاوچاکانی هەرگەلێك کەپاش مردنیان خەڵکی نەزان هاواریان بۆ دەبەنو چاوەڕوانی سوودو لابردنی زیانیان لێ دەکەن، ئەمانە ئەگەرچی پەرستراون بەڵام بەو ئیشانەی کە ئەو نەزانو موشریکانە دەیان کرد رازی نەبون وە پەروەردگار هەر پێش تر بەڵێنی بەهەشتی پێداون دەفەرموێ:

(١٠١) بێگومان ئەوانەی کە هەر لەپێشدا لە لایەن ئێمەوە بەڵێنی بەهەشتیان پێدراوە بە هۆی چاکی وراستی خۆیانەوە ئەو بەندایەتی کردنەی نەفام ونەزانانە وایان لێ ناکات کە لەگەڵ ئەو پەرستراونەی تر بچنە ناو ئاگرەوە، بەڵکو ئەوانە لەو سزاو ئاگرە دورن،

(١٠٢) ئەوان دەنگی کڵپەی ئەوئاگرە نابیسن بەڵکوئەوان لەناو ئەو شتانەدان کە نەفسیان پێی خۆشەو هەتاهەتایین. وە لەوەش زیاتریان لەگەڵدا دەکرێت، وەك دەفەرموێ:

(١٠٣) نە ترسە گەورەکە چ نەفخی سوربێ یان کاتی رەوانەکردنی بەشی ئاگر بۆ ناو ئاگربێ یان کاتی سەربڕینی مردن بێ، هیچکام لەوانە خەمباریان ناکات، چونکە دڵنیان لە چاکەی پەروەدگاریان لەو کاتانەدا، وە فریشتەکانیش بەدەمیانەوە دێنو دەڵێن: ئەمە ئەو رۆژەتانە کە پێش تر لە دنیادا بەڵێنتان پێدرا بو جا بەشادمانی وکەیفخۆشیەوە بەرەو روی برۆن، بەڵێ بەراستی ئەمەرودەدات.

(١٠٤) لە ئەو رۆژەدا کە ئاسمان دەپێچینەوە وەك پێچانەوەی تۆماری نوسراوەکان ولای دەبەین، هەر وەك چۆن لە سەرەتادا خەڵکمان دروستکرد، دیسان هەر ئاوەها بە رێكو پێکی وەك خۆی دەیهێنینەوە، چونکە ئەوە بەڵێنێکەو داومانەو بێگومان ئێمە ئەو بەڵێنە ئەبەینە سەروپاش بونی ئاسمان لای ئەبەینو پاش مردنی گیانلەبەران زیندویان دەکەینەوە بۆحیسابو کیتاب. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {إِنَّكُمْ مَحْشُورُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا ثُمَّ قَرَأَ ﴿كَمَا بَدَأْنَآ أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُۥ﴾ الأنبياء: ١٠٤ / واتە: بێگومان کە ئێوە بە روتیو پێ پەتیو خەتەنە نەکراوی زیندو دەکرێنەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿هەر وەك چۆن لە سەرەتادا خەڵکمان دروستکرد، دیسان هەر ئاوەها وەك خۆی دەیهێنینەوە﴾

(١٠٥) بەراستی لە پاش "لەوحولەحفوز" لە "زەبور"یشدا تۆمارمان کردەوەکە بێگومان ئەم زەویە (کە زەوی دنیا بێ یان زەوی بەهەشت) هەر بەندە چاکەکانی من دەیبەنەوە. واتە خۆشبەختی دنیا وقیامەت هەر بۆ بەندە شایستەو چاکەکانی (ﷲ)یە هەروەك لە پاش "لەوحولەحفوز" لە "زەبور" بەڵکولە قورئانیشدا بڕیاردراوە

(١٠٦) بەراستی ئا لەم پەیامە دا بانگەوازێکی گرنگ هەیە بۆگەلێ کەخوداپەرستن. وە ئەو بەڵێنە بە نرخەی پەروەردگاریان جێگای ئومێدو شادمانیانە.

لَا يَسْمَعُونَ حَسِيسَهَا ۖ وَهُمْ فِي مَا اشْتَهَتْ أَنفُسُهُمْ خَالِدُونَ (١٠٢) لَا يَحْزُنُهُمُ الْفَزَعُ الْأَكْبَرُ وَتَتَلَقَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ هَٰذَا يَوْمُكُمُ الَّذِي كُنتُمْ تُوعَدُونَ (١٠٣) يَوْمَ نَطْوِي السَّمَاءَ كَطَيِّ السِّجِلِّ لِلْكُتُبِ ۚ كَمَا بَدَأْنَا أَوَّلَ خَلْقٍ نُّعِيدُهُ ۚ وَعْدًا عَلَيْنَا ۚ إِنَّا كُنَّا فَاعِلِينَ (١٠٤) وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ (١٠٥) إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَاغًا لِّقَوْمٍ عَابِدِينَ (١٠٦) وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ (١٠٧) قُلْ إِنَّمَا يُوحَىٰ إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّسْلِمُونَ (١٠٨) فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ آذَنتُكُمْ عَلَىٰ سَوَاءٍ ۖ وَإِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ أَم بَعِيدٌ مَّا تُوعَدُونَ (١٠٩) إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ مِنَ الْقَوْلِ وَيَعْلَمُ مَا تَكْتُمُونَ (١١٠) وَإِنْ أَدْرِي لَعَلَّهُ فِتْنَةٌ لَّكُمْ وَمَتَاعٌ إِلَىٰ حِينٍ (١١١) قَالَ رَبِّ احْكُم بِالْحَقِّ ۗ وَرَبُّنَا الرَّحْمَٰنُ الْمُسْتَعَانُ عَلَىٰ مَا تَصِفُونَ (١١٢)

## ٢٢ سُورَةُ الحَجِّ ٧٨

(١٠٧) بە راستی تۆمان هەر بۆ ئەوە رەوانە کردوە کە سۆزو رەحمەت بیت بۆ هەمو جیهانیان.

(١٠٨) ئەی محمدﷺ بڵێ: تەنها ئەوە بە من وتراوە کە خودای ئێوە خودایەکی تەنهایەو هاوبەشی نیە. جا ئایا ئێوە بۆ ئەم راستیە گەردنکەچ دەکەنو خۆ تەسلیم دەکەن؟

(١٠٩) جا ئەگەر ئێوە پشت لەو راستیە دەکەنو باوەڕ ناهێنن ئەوسا بەوان بڵێ: ئەوە من بەبێ جیاوازی پێم راگەیاندنو لە سەرئەنجامی خراپی پشت تێکردنتان ئاگادارمان کردونەتەوە، جا نازانم نزیکە یان دورە ئەو سزایەی کە بەڵێنتان پێدراوە، بەڵام بێگومانە کە دێت.

(١١٠) بێگومان ئەو زاتە هەمو قسەیەکی ئاشکرا ئەزانێ، وە ئەوەیش کە دەیشارنەوە هەروەکو ئاشکراکە دەیزانێ.

(١١١) خۆ من نازانم لە وانەیە کە ئەم دواخستنی سزایە تاقی کردنەوەیەكو رابواردنێك بێت تا ماوەیەکی دیاری کراو بۆتان تا یان بیر بکەنەوەو واز لە خراپە بهێنن یان تا تاوانی زۆرتر بکەنو سزاو چەرمە سەری دوارۆژتان زۆرتر ببێتو هیچ بهانەیەکتان نەمێنی بۆ پاشەرۆژ.

(١١٢) وتی: ئەی پەروەردگارم بە حەقو داد پەروەری بڕیار بدە لەنێوانمان دا، وە پەروەردگاری ئێمە رەحمانە و هەر لەوداوای یارمەتی دەکەین لە سەرئەو قسە نارێك ونابەجێیەی کە ئێوە بەرانبەر بە (ﷲ)و ئاینو پێغەمبەرەکەیﷺدەیکەن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ إِنَّ زَلۡزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَيۡءٌ عَظِيمٞ ﴿١﴾ يَوۡمَ تَرَوۡنَهَا تَذۡهَلُ كُلُّ مُرۡضِعَةٍ عَمَّآ أَرۡضَعَتۡ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمۡلٍ حَمۡلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَٰرَىٰ وَلَٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٞ ﴿٢﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّبِعُ كُلَّ شَيۡطَٰنٖ مَّرِيدٖ ﴿٣﴾ كُتِبَ عَلَيۡهِ أَنَّهُۥ مَن تَوَلَّاهُ فَأَنَّهُۥ يُضِلُّهُۥ وَيَهۡدِيهِ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٥﴾

## ٢٢ سورەتی حەج ٧٨

سورەتی حەج سورەتی بیستو دووهەمی قورئانە، حەفتاو هەشت ئایەتە، زۆربەی راڤەکاران پێیان وایە کە هەندێ لە ئایەتەکانی ئەم سورەتە لە مەکەو ئەویتر لە مەدینەدا هاتوەتەخوارەوە، جا بۆیە وتراوە سورەتێکە هەم مەکیەو هەم مەدەنی، هەم بەشەو هەم بە رۆژ هەم لە کاروانو هەم لەماڵدا دابەزیوەو هەم ئایاتی موحکەمو هەم ئایاتی موتەشابهی تێدایە.

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ ئەی خەڵکینە لە پەروردگاری خۆتان بترسنو خۆتان لە تورەی ئەو زاتەو سزای پاشە رۆژی بپارێزن چونکە رۆژێکی گەورەو پڕ مەترسییە لە پێش دەمدا، بێگومان بومەلەرزەی رۆژی قیامەت روداوێکی زۆرگرنگوگەورەیە.

﴿٢﴾ ئەو رۆژەی کە ئەوەندە دژوارو پڕ مەترسیە کە دایکە شیردەرەکان بێ ئاگا دەبن لە شیر خۆرەکانیانو ژنی دوگیانیش بەردەخات، نەوەك هەر ئەوان بەڵکو تۆ وادەبینی کە خەڵك هەموی مەستو بێهۆشە لەکاتێکدا کەئەوان سەرخۆش نین بەڵام سزاکەی اللَّهُ توندو بەهێزە لەو رۆژەدا، بۆیە ئاوا سەرلێ شێواو هەر کام بەرەو لایەك رادەکات هەر وەك لەدنیادا ئەگەر کەسێك تایەکی سەختی هەبێ وڕێنە دەکاتو هۆشی بە خۆی نامێنێ جا سزای ئەو رۆژەی کە خوا بفەرموێت گەورەیە ئەبێ چۆن بێ؟ اللَّهُ بمانخاتە بەر رەحمەتی خۆی لەو کاتەدا، بەڵێ رۆژێکی ئاوا چاوەڕوانمانەو بێ ئەملاولا پێیدەگەین، کەچی لە دنیادا بە نەفامیو نەزانانە دژایەتی اللَّهُو ئایین ئەکەینو بە گۆرانی شەیتان هەڵدەپەڕین هەر وەك ئەفەرموێ:

﴿٣﴾ هەندێك لە خەڵك هەن کە بە بێ ئەوەی کە هیچ زانیارییەکیان ببێت لە بارەی اللَّهُوە کێشەی بێ سەروبن دەکەنو بڕیاری ناحەق دەدەنو پەیڕەوی لە هەمو شەیتانێکی سەرکەشو بەدفەڕ ئەکەن شەیتانیش کە دوژمنیەتی، هەرگیز بەرەو چاکەی نابات.

﴿٤﴾ پێویست کراوە لە سەر شەیتان کە هەر کەسێك بیکات بە سەرپەرشتی خۆیو خۆی بداتە دەستی خۆبێگومان ئەویش سەری لێ تێك ئەداتو گومڕای ئەکاتو بەرەو سزای ئاگر ئەیباتو داخی دڵی خۆی بەو سوك ئەکات، ئینجا اللَّهُ بۆ سەلماندنی ئەو پاشە رۆژە پڕ مەترسیە دەفەرموێ:

﴿٥﴾ ئەی خەڵکینە ئەگەر ئیوە لە گوماندان لەبارەی زیندو بونەوەداو وائەزانن کە ناتوانین زیندوتان بکەینەوە، جا بە راستی ئێمە ئەم هەیکەلو سەروسیمای ئێوەمان لە یەکەم جاردا لە خاك دروستکردوە کە ئادەمی باپیرتانەو هەر مرۆفێکیش دیسان لەو خواردنەیە کە لەو خاکە سەوز ئەبێو پەروەردە ئەبێت پاش سوڕی خاك لە دڵۆپەیەك تۆماو پاش ئەوەیش لەخوێنێکی خەستو مەیو پاشان گۆشتێکی دروستکراووتەواو، وە گۆشتێکی نەخولقێنراوو ناتەواو تا رۆشنی بکەینەوە بۆتانو تواناییو زاناییو هێزی خۆمانتان پێ بسەلمێنین، جا هەندێکی بەو شێوە تەواو یان ناتەواوە دەیفەوتێنین ئەوەیش کە ئارەزۆی تەواو کردنیمان لێ بێ، لەناو رەحەمدا سەقامگیری دەکەین تا کاتی دیاری کراویو بە مەتۆلکەیی دەرتان ئەهێنینو دێنە دیناوەو هەمو هۆیەکانی ژیانتان بۆ دابین ئەکەین، جا ماوەتان پێ ئەدەین تا ئەگەن بەوپەڕی هێزو توانایی، وە هەندێکتان لەو ماوەیەدا دەمرێنرێنو هەندێکتان پاش ئەو هێزو تواناییەش تەمەنی درێژ ئەکرێت تا ئەگاتە ئەو پەڕی پیریو کەلەلای، جا وای لێدێت کە هیچ نازانێو لە عەقڵدا وەکو منداڵێکی لێ دێ پاش ئەوەی کە عەقڵو زانیاری هەبوە، وە تۆ ئەبینی ئەم زەویە وشكو بێ گژوگییایە هەر کاتێ ئێمە بارانمان بەسەردا باراند ئەجوڵێو بەرز ئەبێتەوەو هەمو جوتێکی دیمەن جوان لە گژوگیا سەوز دەکات.

ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّهُۥ يُحْيِ ٱلْمَوْتَىٰ وَأَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٖ قَدِيرٞ ﴿٦﴾ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٞ لَّا رَيْبَ فِيهَا وَأَنَّ ٱللَّهَ يَبْعَثُ مَن فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِي ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٖ وَلَا هُدٗى وَلَا كِتَٰبٖ مُّنِيرٖ ﴿٨﴾ ثَانِيَ عِطْفِهِۦ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ لَهُۥ فِي ٱلدُّنْيَا خِزْيٞۖ وَنُذِيقُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَذَابَ ٱلْحَرِيقِ ﴿٩﴾ ذَٰلِكَ بِمَا قَدَّمَتْ يَدَاكَ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٖ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٖۖ فَإِنْ أَصَابَهُۥ خَيْرٌ ٱطْمَأَنَّ بِهِۦۖ وَإِنْ أَصَابَتْهُ فِتْنَةٌ ٱنقَلَبَ عَلَىٰ وَجْهِهِۦ خَسِرَ ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١١﴾ يَدْعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَضُرُّهُۥ وَمَا لَا يَنفَعُهُۥۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلضَّلَٰلُ ٱلْبَعِيدُ ﴿١٢﴾ يَدْعُواْ لَمَن ضَرُّهُۥٓ أَقْرَبُ مِن نَّفْعِهِۦۚ لَبِئْسَ ٱلْمَوْلَىٰ وَلَبِئْسَ ٱلْعَشِيرُ ﴿١٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدْخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفْعَلُ مَا يُرِيدُ ﴿١٤﴾ مَن كَانَ يَظُنُّ أَن لَّن يَنصُرَهُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنْيَا وَٱلْأٓخِرَةِ فَلْيَمْدُدْ بِسَبَبٍ إِلَى ٱلسَّمَآءِ ثُمَّ لْيَقْطَعْ فَلْيَنظُرْ هَلْ يُذْهِبَنَّ كَيْدُهُۥ مَا يَغِيظُ ﴿١٥﴾

﴿٦﴾ ئەوە کار گەلێکە کە ئەوە ئەسەلمێنێ کەﷲ هەر خۆی راستەو بێگومان ئەو مردوان زیندو دەکاتەوە، وە بێگومان ئەو زاتە توانایی بەسەر هەمو شتێکدا هەیە.

﴿٧﴾ بێگومان قیامەت دێتو هیچ گومانێکی تێدا نیە، وە بێگومان کە ﷲ تەواوی ئەوکەسانەی کە لەناو گۆڕدان زیندویان ئەکاتەوە. بەڵێ سەرەرای ئەو هەمو بەڵگە بە هێزو بەرچاوانەش کەچی،

﴿٨﴾ لە ناو هەندێك لە خەڵكدا كەسانێك هەن كە بەبێ ئەوەی لەبارەی زاتی ﷲوە، هیچ زانیارییەكیان ببێت كێشەو دەمەقاڵە ئەكەن، جا هەر وەكو زانیاریان نیە هیچ رێنوینیەكیشیان لە لانیە و هیچ پەڕواێكی رۆشنكەرەویشیان لە دەستدا نیە، واتە: قسەكانیان زۆر بێ‌ڕێو جێیەو هیچ بنەمایەكی زانستی نیە، بۆیە شایستەی وەڵامو گوێ پێدان نین.

﴿٩﴾ ئەو كەسە بە لوت بەرزی وبە فیزەوە مل لە حەقو راستی وەرئەگێڕێ تا خەڵكی لە رێگای ﷲدا لابدات، جا ئەم كەسە لە دونیادا هەر سەرشۆڕی بۆ هەیەو لە رۆژی قیامەتیشدا سزای ئاگری سوتێنەری پێ ئەچەژین.

﴿١٠﴾ ئەو سزایەی كە ئەمڕۆ دەرخواردت دەدرێت شتێكی ناحەق نیە، بەڵكو بە هۆی ئەو ئێشە خراپانەیە كە دوو دەستەكەت پێشیان خستوە بۆتوئەنجامت داون، ئەگینا بێگومان كەﷲ هیچ ستەمێك لە بەندەكانی خۆی ناكات. ئینجا قورئان پێناسەی كۆمەڵێكیتر لە خەڵك ئەكاتو ئەفەرموێ:

﴿١١﴾ لە ناو ئەم خەڵكەدا كەسی وا هەیە كە خوا پەرستی ئەكات بە دوودڵیەوەو گۆشەیەك لەم ئایینە ئەگرێتو ناچێتە ناوبنچو بنەوانی ئایینەوە، جا ئەگەر خێرو چاكەی هاتەرێ دڵی ئارام ئەگرێتو ئەڵێت: بە خوا ئەم ئایینە خەیرێك بو بەسەرمدا رژا بەڵام ئەگەر لە سەر خواو ئایین تەنگوو جڵەمەو گرفتاری توش هات بەرەو خراپیو ناڵەباری پێشوی خۆی ئەگەڕێتەوەو لە ئایین پاشگەز ئەبێتەوە كە بەم كارەی دنیاو دوا رۆژیی لە دەست چوو، چونكە بە هۆی ئەوەوە كە لە رواڵەت دا خۆی بە باوەڕدار پیشان ئەدات وەكو بێباوەڕانی تر سود لە دنیا نابات، وە چونكە راستیشی نەكردوە لەقیامەتدا لەگەڵ پیاو چاكانیشدا لێپرسینەوەی لەگەڵدا ناكرێت، ئەوەیە زیانی ئاشكراو روون، ئەمانە وەك كەسێك وان كە لە سەر لێواری كەژێكی بەرز وستاوە جا هەر بە بایەكی سوك دەكەوێتە خوارەوە، ئەمانیش هەر بە وەی كە توشی تەنگانەو چەڵەمەی ژیان ببنو بە ناو وناتۆرە ئێشو ئازاریان بۆ دروست بكرێت پاشگەز دەبنەوە، بەڵام ئەگەر توشی خەیر ببنو رێزیان بۆ دابنرێتو بە پیاو ماقوڵیو پیاوچاكی ناوی ببن بە دینەكەی دڵخۆش دەبێت، واتە: میزانی حەقو ناحەق لای ئەمانە دەستكەوتو خۆشی دنیایە ئەگەر دەستیان كەوت ئەو دینە بەچاك دەزانن‌و ئەگەر توشی بەڵابون لە دین‌و دینداری وازدەهێنن، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: (تَعِسَ عَبْدُ الدينَار وَعَبْدُ الدرْهَم وَعَبْدُ الخَمِيصَةِ إنْ أُعْطِيَ رَضِيَ وَإنْ لَمْ يُعْطَ سَخِطَ تَعِسَ وَانْتَكَسَ وَإذَا شِيكَ فَلا انْتَقَشَ طُوبَى لِعَبْدٍ آخِذٍ بِعِنَانِ فَرَسِهِ فِي سَبِيلِ اللهِ أشْعَثَ رَأسُهُ مُغْبَرةٍ قَدَمَاهُ إنْ كَانَ فِي الحِرَاسَةِ كَانَ فِي الحِرَاسَةِ وَإنْ كَانَ فِي السَاقَةِ كَانَ فِي السَاقَةِ إنْ اسْتَأذَنَ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ وَإنْ شَفَعَ لَمْ يُشَفعْ/ واتە: دەك لە ناوچون ئەوانەی كە بەندەو عەبدی دینارو درهەمو جلو بەرگی جوانن، ئەرگەر ئەمانەیان پێبدرێت رازیو دڵخۆشن خۆ ئەگەر پێیان نەدرێت تورەو ناڕازین دەك لەناوچێتو بەناوچاوانیدا بدات بە زەویداو هەر كاتێك دركێكی پێدا بچیت نەیەتە دەرەوە، وە خۆشا بە حاڵی ئەو كەسەی كە رەشۆی ئەسپەكەی دەگرێتو سەرو پێ تەپو تۆزاوی لەرێی ﷲ دا جیهاد دەكات ئەگەر لە حەرەسی دابنرێت ئەركی حەرسیەكەی بە تەواوی بەجێ‌دەهێنرێت، وە ئەگەر بۆ پاڵنانو لێخوڕین لە پاش سوپاكەوە دانرێت ئەو هەر ئەركی خۆی ئەنجام دەدات، وە ئەگەر دەوای ئیزن بكات ئیزنی پێ نادرێت وە ئەگەر تكا بكات بۆ كەسێك لێی وەرناگیرێت}

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَٰهُ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ وَأَنَّ ٱللَّهَ يَهۡدِي مَن يُرِيدُ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـِٔينَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ وَٱلۡمَجُوسَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿١٧﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُۤ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ۩ ﴿١٨﴾ ۞ هَٰذَانِ خَصۡمَانِ ٱخۡتَصَمُواْ فِي رَبِّهِمۡۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ قُطِّعَتۡ لَهُمۡ ثِيَابٞ مِّن نَّارٖ يُصَبُّ مِن فَوۡقِ رُءُوسِهِمُ ٱلۡحَمِيمُ ﴿١٩﴾ يُصۡهَرُ بِهِۦ مَا فِي بُطُونِهِمۡ وَٱلۡجُلُودُ ﴿٢٠﴾ وَلَهُم مَّقَٰمِعُ مِنۡ حَدِيدٖ ﴿٢١﴾ كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا مِنۡ غَمٍّ أُعِيدُواْ فِيهَا وَذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٢٣﴾

واته مرۆڤێکی نادیارەو بە پێچەوانەی دەستەی یەکەم نە خۆ بەزلزانەو نەدنیاویست بەڵکو مەبەستی رازی کردنی ﷲ یە.

﴿١٢﴾ جا ئەم کەسە جگە لە ﷲ شتێك ئەپەرستێت نە لە سەر پەرستنەکەی سودیی پێ ئەگەیەنێو نە لە سەر نە پەرستنەکەی زیانی لێ دەدات، بەراستی ئەوەیە سەر لێشێواویو گومڕاهی دوور لە حەقیقەتو راستی.

﴿١٣﴾ ئەم مرۆڤە لەم کارەیدا کەسێك ئەپەرستێت کە زیانی نزیکترە لە سودەکەی ئای چ خراپ دۆستو چ خراپ یارو یاوەرێکە بۆی. ئەم ئایەتە لەگەل پێشودا کە فەرموی نە زیانی لێ ئەدا ونە سودی پێ دەگەیەنێ دژایەتی نیە، چونکە ئەو پەرستراوە لە خودی خۆیدا توانای هیچ سودو زیانی نیە بەڵام کابرای پەیڕەویکەر لەو پەرستراوە لە لای خوا بە هۆی ئەو شیرکەوە زیانی دەست ئەکەوێت نە سود، کە مانای ئەم ئایەتەیە.

یان دەگونجێ ئایەتی پێشو کەبە وشەی﴿مَا﴾ هاتوە مەبەست شتە بێعەقڵەکان بێت وەکو بتە تاشراوەکانو خۆرو مانگو ئەستێرەو قەبرو گاو...و...هتد کە ئەوانە نە ئەتوانن سود بە مرۆڤ بگەیەنن ونە زیان، دووهەمیش کە بە وشەی﴿مَن﴾ هاتوە مەبەست پەرستراوە عاقڵەکان بێت وەکو رەئیس خێلو گەورەو سەرۆك حیزبو لێپرسراوی دەستەو گرۆهەکان کە فەرمانەکانیان وەکو فەرمانیﷲ جێبە جێ ئەکەن جا چ بیانەوێو چ نەیانەوێ

ئەبنە خوای ئەو خەڵکە نەزانە، جا ئەمانە دەگونجێ هەندی سودی دنیاییان هەبێت بەڵام زیانیان هەر زۆر نزیکترەو زوویش یەخیان ئەگرێ، ئای چ هاونشینو هاودەمێکی نالەبارە کە لە دنیادا ماڵو سامانو گیانی خۆی بۆ فیدا کرد بەڵام ئەو نەك هەر سودی پێ نەدا بەڵکو نەفرینیشی لێ ئەکات جا تو خوا ئەگەر مرۆڤ ژیر بێتوکەمێ عەقڵی بخاتە کارەوە هەرگیز ئیشی ئاوەها ئەکات؟!

﴿١٤﴾ بێگومان ﷲ ئەوانەی کە باوەڕیان هیناوەو ئیشی چاکیان کردوە ئەیانخاتە ناو باغاتێکەوە کە چەندین جوگای بە ناودا دەڕوات، بێگومان کەﷲ هەرچییەکی بوێت ئەیکاتو کەس ناتوانێ رێگای لێ بگرێت، وە بە راستی ﷲ یارمەتی پێغەمبەرەکەی خۆی ئەدات وبەسەر دوژمنانیدا زاڵی ئەکات

﴿١٥﴾ ئەو کەسەی کەوا گومان ئەکات کە ﷲ لە دنیاو لە دوا رۆژدا یارمەتی پێغەمبەرەکەی نادات دەی با پەتێك بوەستێت بە بنمیچی خانوەکەی خۆیەوەو پاشان با خۆی بخنکێنێ؛ئینجا تەماشا بکاتو بزانێ ئایا بەم فێڵو تەڵکەیەی ئەو، ئاواتی هاتەدیو دڵی ئاوی خوارد ؟ واتە: هەر چەند پێتان ناخۆشبێت بەڵام ﷲ هەر پێغە مبەرەکەیو ئایینەکەی خۆی سەر دەخات جا هەرچی ئەکەن بیکەن ئەگەر خۆ خنکاندنیش بێت.

﴿١٦﴾ جا هەر ئاوەها دەیبینن ئێمە ئەم قورئانەمان رەوانە کرد کە بەڵگە گەلێکی رۆشنکەرەون، وە بە راستی ﷲ ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت رێنمای دەکاتو دەیگەیەنێت بە خۆشبەختی، وە ئەمە ئیشی ﷲیەو کەس ناتوانێ دەستی تێبخات ئەو خودایەو مرۆڤیش بەندەو موڵکێتیو هەر جۆرە ئاڵوگۆڕێکی تێدا بکات بە ویستو ئارەزۆی خۆیەتی.

﴿١٧﴾ بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئەوانەی کە بوون بە جولەکەو بە سەبەئیو بە گاورو بە ئاگر پەرستو ئەوانەی کە شەریکیان بۆ ﷲ داناوە هەروا بە یەك شێوە ناچنو یەك حیسابیان نیە، بەڵکو بە راستی ﷲ لەرۆژی قیامەتدا جیایان دەکاتەوەو ئەوەی کە باوەڕی هێناوە ئەیخاتە بەهەشتەوە، وە ئەوەیش کە باوەڕی راستە قینەی نەهێناوە ئەیخاتە دۆزەخەوە بە راستی خوا ئاگادارە بەسەر هەموشتێکداو ئەزانێ لەدنیا دا کێ راستی کردوە وە کێیش ناراست بووەو هیچی لێ ون نابێت، ئینجا خودا تێمان دەگەیەنێ کە هەر خۆی شایستەی پەرستنەو ئەفەرموێ:

﴿١٨﴾ مەگەر تۆ نابینی کە ئەوەی لە ئاسمانەکاندایە ولە ناو زەویدایەو خۆرو مانگو ئەستێرەکانو چیاکانو دارو درەختو

ئەوەی کە بەسەر زەویدا ئەڕواتو زۆریش لەخەڵك سوجدە بۆ خوا ئەبەن گەلێکیش لە خەڵك سزایان بۆ براوەتەوەو سوكو ریسوا بوون، خۆ ئەو کەسەش کەالله سوكو ریسوای بكات تازە هیچ کەسێکیش رێزی لێناگرێت، بێگومان الله ئارەزۆی لەچی بێت ئەیکاتو هیچ هێزو دەسەڵاتێك نیە کە بتوانێت رێگای لێ بگرێت، ئینجا جارێکی تر ئەچێتەوە سەر باسی سزای خراپەکاران‌و ئەفەرموێ:

(١٩) ئەمانە دووکەسن کە لەسەر پەروەردگاری خۆیان کێشەیان هەیە یەکێکیان لایەنگر یێتیو هەوڵو کۆششی رازی کردنیەتیو ئەوی تریان دوژمنیەتیو هەوڵو تەقەلای رێگرتنی ئایین‌و ناشیرین کردنیەتی، جا ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون پۆشاکێکی ئاگرینیان بە ئەندازەی بەژن‌و باڵایان بۆ دانراوەو لەبەری ئەکەن کە ئاوی کوڵاوو داخیان بەسەردا دەکرێت .

(٢٠) بەو ئاوە داخە هەناویان‌و پێستەکانیان ئەتوێتەوە.

(٢١) جا گورزی ئاسنینیان بۆ هەیەو بەو گورزانە لێان ئەدرێت. پۆشاکی ئاگرو ئاوی کوڵاو بەسەراکردن‌و دانەبەر گورزی ئاسن دیاری پاشەرۆژی بێباوەڕانە ئەمە تەنها جارێك نیە وبۆ یەك ماوەی کورت نیە بەڵکو درێژەی هەیە وەك دەفەرموێ:

(٢٢) هەر کە ئەیانەوێ لەو ئاگر دەربچن با دەدرێنەوە بۆ ناوی‌و پێیان ئەوترێت: بچەژن سزای ئاگری سوتێنەر. جا هەر وەك باوی قورئانە الله پاش باسی خراپان‌و سزایان باسی چاکان‌و پاداشتیان ئەکات وئەفەرموێ:

(٢٣) بێگومان الله ئەوکەسانەی کە باوەڕیان هێناوەوکرداری چاکیان ئەنجام داوە ئەیانباتە ناوباغاتێکەوە کە جۆگەکان بە ناویاندا ئەڕۆن سەرەڕای ئەمەش لەناو ئەو باغانەدا بەبازنە زێڕینەکان وبە مرواری دەڕازێنرێنەوەو هەر وەکو پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: (تَبْلُغُ الحِلْيَةُ مِنَ المُؤْمِنِ إِلى حَيْثُ يَبْلُغُ الوُضُوءُ/واتە: خشڵو رازاندنەوەی باوەڕدار ئەگاتە ئەو شوێنەی کە ئاوی دەست نوێژ پێی دەگات} وە پۆشاکی ئەوان لەناو ئەو باغاتانەدا هەوریشمە، جا ئەی عاقڵ تەماشا بکە ئەوانەی کە لە دنیادا هەوریشمیان دەپۆشیو گوێیان بە حەڵاڵو حەرام نەدەدا وا ئەمڕۆ پۆشاکی ئاگرین دەپۆشن بەڵام ئەوانەی کە فەرمانی اللهو پێغەمبەرەکەیان ئەنجام دەداو لەسەر بڕیاری ئەوان هەوریشم‌و زێڕیان لە خۆیان قەدەغە کرد بو وا ئەمڕۆ اللهبەو دووانە خەڵاتیان دەکات. هەروك پێغەمبەرمان ﷺفەرمویەتی: {لَا تَلْبَسُوا الحَرِيرَ وَلَا الدِّيبَاجَ وَلَا تَشْرَبُوا فِي آنِيَةِ الذَّهَبِ وَالفِضَّةِ وَلَا تَأْكُلُوا فِي صِحَافِهَا فَإِنَّهَا لَهُمْ فِي الدُّنْيَا وَلَنَا فِي الآخِرَةِ /متفق عليه/

وَهُدُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّيِّبِ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَهُدُوٓا۟ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ ٱلَّذِى جَعَلْنَٰهُ لِلنَّاسِ سَوَآءً ٱلْعَٰكِفُ فِيهِ وَٱلْبَادِ ۚ وَمَن يُرِدْ فِيهِ بِإِلْحَادٍۭ بِظُلْمٍ نُّذِقْهُ مِنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٥﴾ وَإِذْ بَوَّأْنَا لِإِبْرَٰهِيمَ مَكَانَ ٱلْبَيْتِ أَن لَّا تُشْرِكْ بِى شَيْـًٔا وَطَهِّرْ بَيْتِىَ لِلطَّآئِفِينَ وَٱلْقَآئِمِينَ وَٱلرُّكَّعِ ٱلسُّجُودِ ﴿٢٦﴾ وَأَذِّن فِى ٱلنَّاسِ بِٱلْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ ﴿٢٧﴾ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَٰمِ ۖ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴿٢٨﴾ ثُمَّ لْيَقْضُوا۟ تَفَثَهُمْ وَلْيُوفُوا۟ نُذُورَهُمْ وَلْيَطَّوَّفُوا۟ بِٱلْبَيْتِ ٱلْعَتِيقِ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ وَمَن يُعَظِّمْ حُرُمَٰتِ ٱللَّهِ فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُۥ عِندَ رَبِّهِۦ ۗ وَأُحِلَّتْ لَكُمُ ٱلْأَنْعَٰمُ إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلرِّجْسَ مِنَ ٱلْأَوْثَٰنِ وَٱجْتَنِبُوا۟ قَوْلَ ٱلزُّورِ ﴿٣٠﴾

هەوریشم، بەجۆرەکانییەوە نە قایم وەنە تەنکی نەپۆشن وە لە کاسەی زێڕو زیوی دا نەخۆن‌و نەخۆنەوە، چونکە بێگومان ئەوە بۆ بێباوەڕانە لە دنیاداو بۆ ئێوەیە لە پاشە رۆژدا}. بەڵێ ئەم باوەڕدارە چاکە کارانە چونکە خواو ئاینیان ویستوە پشتگوێ نەخراون.دەفەرموێ:

(٢٤) ئەوانە هەم بۆ هەمو قسە پاك‌و جوانەکان رێنمای کراون کە گەورەترینیان وشەی (لا اله الا ا )یە کە وشەی یەکخواپەرستیە، وە هەم لەدنیادا بۆرێگای پەسەندی اللهی سوپاسکراو رێنمای کراون، جا ئەم رێنماییە دەیانگەیەنێت بەو جێگایەی کە هەر قسەی چاکی تێدا ئەکرێت کە بەهەشتە، هەروەك چۆن لەدنیادابە بێ ماندو بون هەناسە دەدەین خەڵکی بەهەشتیش هەر بە سوپاسی اللهوە بەبێ ماندو بون خەریك دەبن. بەڵێ ئەوەی کەباسکرا پاداشی ئەو دوو تاقمە بون کە یەکێکیان بۆ خوا ئەویتریان دژی خوا لە دنیادا دژایەتی یەکتریان ئەکرد، ئەم لەیەك دانی راستو ناراستە هەتا قیامەت هەر ئاوا درێژەی دەبێت. وتراوە ئەمە لەکاتێکدا دابەزیوە کە علی وحەمزە وعوبەیدەی ئامۆزای پێغەمبەرﷺ لە غەزای بەدردا دەرچون بۆشەیبەوعوتبەی کوڕی رەبیعەو وەلیدی کوڕی عوتبە کەسیانەکەی پێشو بۆ خواو سیانەکەی دوایش دژی خوا بەرانبەر یەك وەستان ولەئاکامدا هەرسێ بێباوەڕەکان کوژران وعوبەیدەیش شەهید بو.

(٢٥) بەڕاستی ئەو کەسانەی کە بێباوەڕنو ڕێگا لە ئایینی خودا ئەگرن وئەبن بەپەرچ لەرێگای بلاّو بونەوەی‌داو بەرگری خەڵك لە ماڵی خوا دەکەن ئەو ماڵەی کە بۆ هەمو خەڵکمان داناوە کە یەکسانە تێیدا خەڵکی نیشتەجێی ناو مەکەو خەڵکی کاروانی، وە هەرکەسێك بییەوێ لەوێدا هەر جۆرە نارێکیو ستەمێك بکات سزایەکی دەردناکی پێدەچەژین. ئەم چەند ئایەتە ئەوە دەگەیەنن کەئەم ئایەتانە لە(مەدینە)دا هاتبێتە خوارەوە، لەبەر ئەوە وتراوە کە ئەم سورەتە سورەتێکی سەیرە دوو سوجدەی تێدایە، بەشەوو بەرۆژ دابەزیوە، لە سەفەرو لەماڵدا هاتوە،(مەکە)ی و(مەدینە)ییە،ئاشتیەوجەنگیە،هەڵوەشێنەرەوەو هەڵوەشێنراوەیە {الناسِخُ والمَنسُوخ}وموحکەم و موتەشابیهە، واتە ئەوانە هەمو لەم سورەتەدا روی داوە.

(٢٦) باس بکە ئەو کاتەی کە جێگای (کەعبە)مان بۆ ئیبراهیم دیاری کرد کە دروستی بکات بۆ بەندایەتی تێداکردنیو پێمان وت: کە هیچ هاوبەشێك بۆ من دانەنێیتو ماڵەکەم پاكو خاوێن بکەرەوە بۆ ئەوانەی کە تەنها بۆ تەواف هاتون بۆ ئەو شوێنەو ئەوانەیش کە خەڵکی ئەوشوێنەن، وە بۆگەردنکەچان وسوجدەبەران کە نوێژکەرانن. ئەمە ترساندنو سەرزەنشتێکی گەورەیە بۆ قورەیش کەرێزی ئەوان بەهۆی ماڵێکەوەیە کە یەکەم جار بۆ یەکخواپەرەستی دروستکراوە کەچی ئەوان لەوێدا بت ئەپەرستن؟!

(٢٧) جا وتمان بە ئیبراهیم: جاڕبدە بەناو خەڵکدا بۆ حەج کردن، جا کە بانگت کرد لە هەمو رێگایەکی قوڵو دورەوە بە پیادەو بەسەر هەمو شتێکی لەرو لاوازەوە دێن بۆ لات.

﴿ضَامِرٍ﴾ واتە لەڕ،لاواز، لە راستیدا ئەمە هەمو هۆیەکانی ئازوگویازی سەردەم ئەگرێتەوە، وەك: تەیارەو سەیارە.

(٢٩) تا ئامادەی ئەو سودانەی خۆیان ببن هەم بازرگانی وهەم عیبادەت، وە تا ناوی ﷲ ببەن لەکاتی سەربرینی ئەو ئاژەڵانەدا کە ﷲکردویەتی بە رۆزیان لەو چەند رۆژە دیاریانەدا، وە بە یاد کردنی ﷲ سوپاسی ئەو هەمو نیعمەتانەی بکەن، جا لەو قوربانیانەی کە ئەیکەن خۆتان لێیان بخۆنو بیدن بە هەژارانو نەدارانیش.

(٢٨) پاش ئەو ئاژەڵ سەربرینە با چڵكو پیسی لە خۆیان لابەن جا بە سەر تاشین یان کورت کردنەوەو نینوکگرتن، دەست پێ بکەن، پاشان خۆشۆردنوپاكوخاوێنی، وە ئەوەی کە پێویستیان کردوە لە سەر خۆیان لەکردارەکانی حەجو جگە لەویش جێبەجێی بکەن، وەبا بە دەورەی ماڵی خوادا بسوڕێنەوەو تەوافی هاتنە خوارەوە بەجێ بهێنن.

﴿ٱلۡعَتِيقِ﴾ واتە: کۆن،چونکە ماڵی خوا یەکەم ماڵە کە لەم سەر زەویەدا بۆ خەڵك دروستکراوە.

(٣٠) بڕیار ئەوەیە کە ئاوا بکەن خۆ هەر کەسێك قەدەغە کراوەکانی ﷲ بە گەورە بگرێت وسنور نەبەزێنێت، ئەوسا ئەوە چاکە بۆی لەلای پەروەردگاری، وە مەڕو بزن وگاو وشتریان بۆحەلاڵ کراوە جگە لەوەی کە لە ئایندەدا ئەخوێنرێتەوە بەسەرتاندا، جا ئەوەبو لەمەدینەدا سورەتی (ا ائدة) دابەزیو ئەو قەدەغ ەکراوانەی دیاری کرد، ئینجا ئەفەرموێ جا خۆتان دور بخەنەوە لەپیسی کە بتەکانو نەیانپەرستنوخۆتان لەقسەی ناڕەواو درۆو ناحەق دور بخەنەوە،

پیغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {ألا أُنبئُكُمْ بِأَكْبَرِ الكَبَائِرِ قُلْنَا بَلَى يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ الْإِشْرَاكُ بِاللهِ وَعُقُوقُ الوَالِدَيْنِ وَكَانَ مُتكِئًا فَجَلَسَ فَقَالَ أَلا وَقَوْلُ الزورِ وَشَهَادَةُ الزورِ أَلا وَقَوْلُ الزورِ وَشَهَادَةُ الزورِ فَمَا زَالَ يَقُولُهَا حَتى قُلْتُ لَا يَسْكُتُ/ متفق عليه / واتە: ئایا گەورەترینی تاوانە گەورەکانتان پی نەڵێم؟ وتمان: بەڵێ ئەی پیغەمبەری خواﷺ.فەرموی: شەریك دانان بۆخوا ودەرچون لە فەرمانی دایكو باوك، پێغەمبەرﷺ کە شانی داهێڵا بوو ئینجا دانیشت، جا فەرموی: ئاگادار بن قسەی درۆ هەڵبەستن، ئاگادار بن شایەتی درۆدان، ئەوسا ئەمانەی ئەوەندە وتەوە تا وتم تازە بێدەنگ نابێت}

بە داخەوە ئەمرۆ کێ چاکتر بزانێ درۆ هەڵبەسێتو درۆ بڵێت ئەوە سیاسەتمەدارو لێزانترە؟! نازانن کە ئەوە نیشانەی ئاخر زەمانە قسەیەکی راستەو فەرمودەی پێغەمبەرمانە: {سَيأتِي عَلَى الناسِ سَنَوَاتٌ خَدَاعَاتٌ يُصَدقُ فِيهَا الكَاذِبُ وَيُكَذبُ فِيهَا الصادِقُ وَيُؤْتَمَنُ فِيهَا الخَائِنُ وَيُخَونُ فِيهَا الأَمِينُ وَيَنْطِقُ فِيهَا الرُّوَيْبِضَةُ قِيلَ وَمَا الرُّوَيْبِضَةُ قَالَ الرجُلُ التافِهُ فِي أَمْرِ العَامةِ/ واتە: بەم زوانە ساڵانێکی فریودەر بە سەر خەڵکدا دێت کە دۆزن تێیدا بە راستگۆ دادەنرێتو راستگۆیش بە درۆزن، وە خیانەتکار بە ئەمینو پیاوی ئەمینیش بەخیانەتکار هەژمار دەکرێت، وە روەیبیزەکان دەبنە دەم راستی خەڵك. بێژرا روەیبیزە کێیە؟ فەرموی: پیاوی هیچو پوچەوەو لە کاروباری گشتیدا قسە دەکات}.

(٣١)راست هەر بۆ خودا بنو هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنێن، چونکە هەرکەسێك هاوبەش‌دانێت بۆﷲ جا وەك ئەوە وایە کەلە ئاسمانەوە بەربوبێتەوە، جا باڵندە پری بداتێ وبیفڕێنێت وگاڵ

گالّی بكات یان گژە بایەكی توند لێی بداتو بیخاتە شوێنێكی دورەوە، جا ئەو كەسەی كە لە ئاسمانی بەرزو چاودێری كراوی ئیمان بە هۆی شیركو كوفرەوە بكەوێتە خوارەوە جگە لە سزاو بەلاّی دنیاو پاشەرۆژ شتێكی تری دەست ناكەوێت واتە موشریكان ئاوەهان‌وتازە لە ریزی بنیام دەرئەكرێن ولە دنیادا وەك ئاژەڵن‌و لە رۆژی قیامەتیشدا بۆ هەمیشە بە كەڕوكوێرولاڵی لەناو ئاگری دۆزەخدان.

﴿سَحِيقٍ﴾ واتە: شوێنی دوردەست ونائومێد كەر.

(٣٢) بڕیاری ﷲ بەو شێوەیە كە هەركەسێك دروشمەكانی ﷲ بە گەورە بگرێ‌و رێزی بۆ دابنێت، ئەوسا بە راستی ئەو رێزگرتنانە لەبەشی پارێزكاری دڵەكانە، واتە ئەودڵانە لە خوا ترس‌و پارێزكارن بۆیە ئەوهەڵوێستە چاكانە دەنوێنن.

(٣٣)بۆتان هەیە سود گەلێك لەو مەڕو بزن‌و گاو وشترەی كە دەیبەن بۆ سەر برین لەمەكەدا تا ماوەی دیاری كراو كە رۆژی قوربانی كردنە وەك شیرو خوری‌و موو ئازو گویاز كردنی كەل‌وپەل بەوان، پاشان جێگای سەربڕینیان لەلای ئەوماڵە كۆنەدایە كە ماڵی خوایە، ئەمە باسی قوربانی حاجیانەو ئەبێ كە ئەو ئاژەڵانە لەدەوروبەری ئەو ماڵەدا سەرببڕێن‌و هەر شێوە سودێكیان لە پێشەوە لێ وەرگیرێت دروستە.

(٣٤) بۆ هەرگەل‌و ئایینێك یاسای بەندایەتی‌و قوربانی كردنمان داناوە تا ناوی خوا بهێنن لەسەر سەربڕینی ئەوانەی كە كردومانە بە رۆزیان لەو مەڕو بزن‌و وشترو گایانە، جا پەروەردگارو خوای ئێوە خوایەكی تەنهایە دەی ئەبێ تەنها بۆئەو گەردنكەچ‌و تەسلیم بن‌و كەسێكی‌تر نەكەن بە هاوبەشی نەلە كاتی سەربڕینی ئاژەڵداو نە لەكاتی هیچ بەندایەتیەكی تردا، جا مژدە بدە بەوانەی كە خۆیان بە كەم دەگرن‌و بە دەعیەو لوت بەرز نین ئەوانە كێن؟

(٣٥) ئەو كەسانەن كە هەركاتێ ناوی خوا ببرێت دڵەكانیان دەترسێت‌و دێتە هەشۆكان، وە ئەوانەن كە خۆگرن لەسەر ئەوشتانەی كە دوچاریان ئەبێت لەدنیاداو نوێژدەكەن‌و لەوەی كە پێمانداون دەبەخشن، واتە" ئەو چوار وەسفە وەسفی خۆ بەكەم زانانە﴿ٱلۡمُخۡبِتِينَ﴾ ئینجا ﷲ ئەفەرموێ:

(٣٦)وشترە گەورەو قەڵەوەكانمان داناوە بۆتان كە بەشێك بن لە دروشم‌و بەڵگەی دۆزینەوەی بڕیارو فەرمانەكانی ﷲو سودێكی زۆریان تێدا هەیە بۆتان، جا كاتێ كە ئامادەكرا بۆ سەربڕین بەم شێوەیە كە لەسەر سێ‌لاقی وەستاوەو لاقێكی بەسراوەتەوە، ئینجا

حُنَفَآءَ لِلَّهِ غَيۡرَ مُشۡرِكِينَ بِهِۦۚ وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخۡطَفُهُ ٱلطَّيۡرُ أَوۡ تَهۡوِي بِهِ ٱلرِّيحُ فِي مَكَانٖ سَحِيقٖ ﴿٣١﴾ ذَٰلِكَۖ وَمَن يُعَظِّمۡ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقۡوَى ٱلۡقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ مَحِلُّهَآ إِلَى ٱلۡبَيۡتِ ٱلۡعَتِيقِ ﴿٣٣﴾ وَلِكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلۡنَا مَنسَكٗا لِّيَذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلۡأَنۡعَٰمِۗ فَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَلَهُۥٓ أَسۡلِمُواْۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُخۡبِتِينَ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَٱلصَّٰبِرِينَ عَلَىٰ مَآ أَصَابَهُمۡ وَٱلۡمُقِيمِي ٱلصَّلَوٰةِ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَٱلۡبُدۡنَ جَعَلۡنَٰهَا لَكُم مِّن شَعَٰٓئِرِ ٱللَّهِ لَكُمۡ فِيهَا خَيۡرٞۖ فَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهَا صَوَآفَّۖ فَإِذَا وَجَبَتۡ جُنُوبُهَا فَكُلُواْ مِنۡهَا وَأَطۡعِمُواْ ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرۡنَٰهَا لَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿٣٦﴾ لَن يَنَالَ ٱللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَآؤُهَا وَلَٰكِن يَنَالُهُ ٱلتَّقۡوَىٰ مِنكُمۡۚ كَذَٰلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمۡ لِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٣٧﴾ ۞إِنَّ ٱللَّهَ يُدَٰفِعُ عَنِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ خَوَّانٖ كَفُورٍ ﴿٣٨﴾

ناوی ﷲ ی لەسەر بهێنن‌و سەری ببڕن، ئەوسا هەر كاتێ كەوتن‌و پاك كران‌و ئامادەكران بۆ خواردن، جا خۆتان لێی بخۆن‌و پاشان بیدەن بە هەمو كەسێكی نەدار داواكەرو داوانەكەر، بە شاری‌و لادێی‌و بە نیشتەجێ‌و بە رێبوار، بە داراو نەدار. هەر ئاوەها كە دەیبینن رام‌و گەردنكەچمان كردون بۆتان، سا بەڵكو ئێوەش ورد ببنەوەو سوپاسی ئێمە بكەن.

﴿ٱلۡقَانِعَ وَٱلۡمُعۡتَرَّ﴾ بە چەندین مانا باسكراون ئەوە هەندێك لەو مانایانە بو، جا تەماشای ئەو وشترە زەبەلاح‌و گەورە بكەن كە چۆن ﷲ رام‌و گەردنكەچی كردوە بۆمان كە سێ پڵنگ بە ئەندازەی‌و شترێك نابن كەچی مرۆڤ ناتوانێ بەبێ چەك‌و چۆڵە لەیەك پڵنگیش نزیك بكەوێتەوە نەك دوان‌و سیان؛

(٣٧) نە خوێنی ئەو وشترە قوربانیانەو نە گۆشتەكانیان هەرگیز بە ﷲ ناگات‌و نیازیشی بەوە نیە بەڵام ئەو پارێزكاری‌و لە خوا ترسیەكەی ئێوەی دەوێت‌و پەسەندی ئەكاو هەر ئەوەیشی مەبەستە، هەر ئاوەها ﷲ ئەو وشترانەی رامكردوە بۆتان بۆ ئەوەی ﷲ بە گەورەو خاوەن دەسەڵات بزانن‌و سوپاسی بكەن لەسەر ئەوەی كە رێنمای كردون بۆ ئەم ئایینە، وە ئەی محمدﷺمژدە بدە بەوانەی كە چاكە كارن‌و هەمیشە وائیش ئەكەن وەك ئەوەی كە چاویان لەﷲبێت. پێویستە لەسەر ئەو كەسەی كە قوربانی یان هەر ئیشێكی چاكەی تر ئەكات لە ناخی دڵیەوە تەنها مەبەستی رەزامەندی ﷲ بێت‌و هیچی تر، وە

أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُوا۟ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُوا۟ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوْلَا دَفْعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعْضَهُم بِبَعْضٍ لَّهُدِّمَتْ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٌ وَصَلَوَٰتٌ وَمَسَـٰجِدُ يُذْكَرُ فِيهَا ٱسْمُ ٱللَّهِ كَثِيرًاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِىٌّ عَزِيزٌ ﴿٤٠﴾ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّـٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِۗ وَلِلَّهِ عَـٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَثَمُودُ ﴿٤٢﴾ وَقَوْمُ إِبْرَٰهِيمَ وَقَوْمُ لُوطٍ ﴿٤٣﴾ وَأَصْحَـٰبُ مَدْيَنَۖ وَكُذِّبَ مُوسَىٰ فَأَمْلَيْتُ لِلْكَـٰفِرِينَ ثُمَّ أَخَذْتُهُمْۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٤﴾ فَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ أَهْلَكْنَـٰهَا وَهِىَ ظَالِمَةٌ فَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ ﴿٤٥﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَآ أَوْ ءَاذَانٌ يَسْمَعُونَ بِهَاۖ فَإِنَّهَا لَا تَعْمَى ٱلْأَبْصَـٰرُ وَلَـٰكِن تَعْمَى ٱلْقُلُوبُ ٱلَّتِى فِى ٱلصُّدُورِ ﴿٤٦﴾

قوربانی کردن وەك هەمو عیبادەتەکانی تر بۆ ئەوەی کە وەر گیرێت دە بێت جگە لەمە کەنیەتی پاکبێ دەبێ بەو شێوەیە بێت کە لە شەرعدا دیاری کراوە. پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: {إن أولَ مَا نَبْدَأُ فِي يَوْمِنَا هَذَا أنْ نُصَلِيَ ثُم نَرْجِعَ فَنْنحَرَ فَمَنْ فَعَلَ ذَلِكَ فَقَدْ أَصَابَ سُنَتَنَا وَمَنْ نَحَرَ قَبْلَ الصلاةِ فَإنمَا هُوَ لَحْمٌ قَدمَهُ لِأَهْلِهِ لَيسَ مِنْ النسْكِ فِي شَيْءٍ/ متفق عليه/ واتە: یەکەم شتێ کە لەم ڕۆژی جەژنی قوربان‌دا دەستی پێدەکەین نوێژ کردنە پاشان دەگەڕێینەوە بۆ ماڵو قوربانی ئەکەین، جا هەر کەسێك ئاوەهای کرد ئەوە سوننەتی ئیمەی پێکاوە، وە هەر کەسێك بەرلە نوێژ ئاژەڵ سەربڕێت ئەوە تەنها گۆشتێکەو پێشکەشی خاوخێزانی کردوەوهیچ پەیوەندی بە قوربانیەوە نیەو حیسابی قوربانی بۆ ناکرێت}

﴿٣٨﴾بێگومان کە ﷲ پارێزگاری لەو کەسانە ئەکات کە باوەڕیان هێناوە چونکە بە بێگومان کە ﷲ هیچ خیانەتکارو کافرو سپڵەیەکی خۆش ناوێ.

﴿٣٩﴾ ماوەی شەڕ کردن درا بەو کەسانەی کە شەڕیان لەگەڵدا دەکرێت، چونکە بەراستی ئەوانە ناهەقیان پێکراوەوبێگومانﷲ زۆر بەتوانایە لەسەر یارمەتی دان‌وسەرخستنیان. کێن ئەوانەی کە ناهەقیان پێکراوە ؟

﴿٤٠﴾ ئەو کەسانەن کە بە ناحەق لە ماڵەکانیان دەرکراون‌و هیچ تاوانێکیان نیە جگە لەوەی کە ئەڵێن: پەروەردگارمان ﷲیە، بەڵێ ئەبێ ئەو جۆرە جەنگانە لە نێوان سوپای ئیمان‌و کوفر روبداتو هێزی ﷲ لەدەستی موسڵمانانەوە دەرکەوێت، چونکە ئەگەر ﷲ هەندێك لە خەڵکی بە هەندێکیتر لەناو نەبردایە هەمو جێگاکانی خوا پەرستی لەناو دەچون‌و دەڕوخێنران چ دێرەکان بوایە کە خەڵوەتگای تاکە تاکە خواپەرستەکانەو چ کڵیسەکان و چ کەنشتەکان‌و چ مزگەوتەکان بوایە کە لە ناو ئەواندا زۆر ناوی ﷲ ئەبری‌و یادی ئەکرێت، بەدڵنیاییەوە ﷲ یارمەتی ئەوکەسە دەدات کە یارمەتی ئایینی ﷲ دەدات، بەراستی ﷲ زۆر بە توانایەو زاڵ‌وبەدەسەڵاتە. جا زاتێ ئاوا بێ چۆن سەر ناکەوێ‌و کێ ئەتوانێ بەرانبەری بوەستێت. ئەمە هەم موژدەیەو هەم هەڕەشە، موژدەیە بۆ ئەوانەی کە لەکارو کۆشش‌و جەنگیان‌دا تەنها مەبەستیان ﷲیە با نەترسن‌و دڵنیا بن کە ﷲ یارمەتیان ئەدات، هەڕەشەیە بۆ بێباوەڕان‌و خوا نەناسان کە هەرچی بکەن هەر شکەست ئەخۆن، چونکە دەرەقەتی هێزی ﷲ نایەن، وە لە لایێکی ترەوە بۆ ئەوانەی کە بەناوی خواوە جیهاد ئەکەن بەڵام مەبەستیان پاك‌وخاوێن نیەو جگە لە ﷲ تێکەڵاوی مەبەستیانە، ئەمانەیش ﷲ بەڵێنی یارمەتی‌دانی پێ‌نەداون‌و سەرکەوتنیان نابێ مەگەر بەهۆی ستەمکاری زۆری لایەنەکەی تر یان بە هۆی زۆری هێزو دەسەڵاتیان لە بەرامبەر دوژمنەکەیانەوە یان هەر ئیرادە کەونیەکی‌تری ﷲ، جا پێویستە لەسەر ئەم بەشە ئەگەر باوەڕی بەﷲ راستە، زوو لەو بۆچونە هەڵانە بگەڕێنەوەو پەشیمان ببنەوەو تەنها لەبەر ﷲ بجەنگێن تا بەر یارمەتی ئیرادە شەرعیەکەی ﷲ بکەون. ئینجا وەسفی ئەوانە ئەکات کە باوەڕداری راستن‌و ﷲ یارمەتیان ئەداتو ئەفەرموێ:

﴿٤١﴾ ئەو کەسانەن کە ئەگەر ئیمە جێگیرمان کردن لەزەویدا نوێژ ئەکەن‌و زەکات ئەدەن‌و فەرمان ئەکەن بۆ ئەنجامدانی هەمو ئیشێکی چاك‌و بەسود بۆ خەڵك، وەبەرگری ئەکەن لەکاری خراپە، بەڵێ نوێژ کردن‌و زەکات دان‌و فەرمان بە چاکە کردن‌و بەرگری لە خراپە کردن وەسفی ئەو کەسانەیە کە ﷲ یارمەتیان ئەداتو بەسەر دوژمنانیاندا زاڵ ئەکات، وە هەر بۆ ﷲیە سەر ئەنجامی هەموکارێك جا ئەمە بەردی داخ نانە بە دڵی کافران‌و بێباوەڕاندا چی‌ئەکەن بیکەن سەرئەنجام هەر دۆراون.

( المعروف) بە هەمو کارێك ئەوترێت کە لە روانگەی شەرعەوە پەسەند بێت. (المنكر) بە هەر کارێك ئەوترێ کە لە روانگەی شەرعەوە پەسەند نەبێت. ئینجا ﷲ بۆدڵدانەوەی پێغەمبەرﷺ و پەیڕەوانی وا باسی هەندێ لە گەلانی پێشو بە کورتی دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٤٢﴾ ئەگەر ئەو بێباوەڕانە باوەڕ بە تۆ ناكەن‌و بە درۆت ئەخەنەوە با دڵت نارەحەت نەبێ، چونكە ئەمە تەنها بۆ تۆ نەبوە بەڵكو بەراستی پێش ئەوان گەلی "نوح"و "عاد"و "سەمود" پێغەمبەرەكانیان كە نوح‌و هودو صالح بون(سەلامی خوایان لێبێ) بە درۆیان خستنەوەو باوەڕیان پێنەكردن.

﴿٤٣﴾ خۆ گەلی ئیبراهیم‌وگەلی لوتیش،

﴿٤٤﴾جا خەڵكی مەدیەنیش كە گەلی شوعەیب بون، باوەڕیان بە پێغەمبەرەكانیان نەكردو بە درویان خستنەوە خۆ موسایش بە درۆ خرایەوە، جا ماوەم دا بە بێباوەڕان تا بە ئارەزۆی خۆیان ئەسپی خۆیان لەمەیدانی كوفرو بێباوەڕیدا تاو دەدەن، پاشان تۆڵەم لێ سەندون جا بزانن ناڕازی بونی من ئەوانی بە چ سەر ئەنجامێك گەیاندو چییان بەسەرهات‌و چۆن ئەو نازو نیعمەتەی كە تێیدا بون گۆڕیم بۆ سزاو لەناوچونیان؟ واتە با ئەوانەیش كە باوەڕ بە تۆ ناكەن هەرچی زووتر بە خۆیاندا بێنەوەو دەست لە بێباوەڕی‌و دژایەتیت هەڵگرن، ئەگینا لە دەستی ئێمە دەرناچن‌و ئاوا سەرئەنجامێكیش چاوەڕێیانە.

﴿٤٥﴾جا زۆر وڵاتمان قڕ تێخستوون‌و لەناومان بردوون لەحاڵێكدا كە ستەمكار بوون، جا ئەو وڵاتانە وێران بوون‌و داریان بەسەر بەردەوە نەماوەو بیری بێ‌خاوەن كەلە پێشدا قەرەباڵغ بوون‌و شەڕیان لەسەر دەكرد وا ئیستا دەبینن كە چۆڵ‌و بێ‌خاونن‌و كۆشكی بەرزو بتەوو سپی‌كراوەیان ئاوا بوون بە وێرانەو كەلاوەی روخاو.

﴿٤٦﴾ ئایا نەگەڕاوون بەناوی زەویدا ئەوسا دڵانێكیان هەبێ كە راستی پێ بزانن یان گوێچكەیانێكی بیسەریان هەبێ لەو هەمو قسەو ئامۆژگاریە پەندو ئاموژگاری وەرگرن؟ جا بێگومان راستی ئەوەیە كە ئەوان چاوی سەریان كوێر نیە بەڵام ئەو دڵانەی كە لەناو سینگیاندایە كوێرەو بێ‌ئاگایەو پەندو ئامۆژگاری وەرناگرێت.

﴿٤٧﴾ جا ئەوان هەر بە پەلە داوای هاتنی سزا ئەكەن، چونكە بەلایانەوە راست نیەو نازانن كە ئەوە بەڵێنی اللهیەو ئەو زاتە هەرگیز پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناكات بەڵكو هەمو بەڵێنەكانی لەكاتی خۆیدا دێتەدی‌و بێگومان یەك رۆژیش لەلای پەروەردگارت وەك هەزارساڵی ئێوەیە، واتە: الله هەر چەند ماوە بە ستەمكاران‌و بێباوەڕان بدات‌و بەلای ئێوەوە زۆر بێ بەڵام لەلای الله وەك ئەندازەی كەمتر لە كاتژمێرێكی ئیوەیە. جا وورد ببنەوە ئەی ستەمكاران.

وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥۚ وَإِنَّ يَوۡمًا عِندَ رَبِّكَ كَأَلۡفِ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٤٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ أَمۡلَيۡتُ لَهَا وَهِيَ ظَالِمَةٞ ثُمَّ أَخَذۡتُهَا وَإِلَيَّ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٤٨﴾ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّمَآ أَنَا۠ لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿٤٩﴾ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٥٠﴾ وَٱلَّذِينَ سَعَوۡاْ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥١﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رَّسُولٖ وَلَا نَبِيٍّ إِلَّآ إِذَا تَمَنَّىٰٓ أَلۡقَى ٱلشَّيۡطَٰنُ فِيٓ أُمۡنِيَّتِهِۦ فَيَنسَخُ ٱللَّهُ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ ثُمَّ يُحۡكِمُ ٱللَّهُ ءَايَٰتِهِۦۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٥٢﴾ لِّيَجۡعَلَ مَا يُلۡقِي ٱلشَّيۡطَٰنُ فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡقَاسِيَةِ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَفِي شِقَاقِۭ بَعِيدٖ ﴿٥٣﴾ وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ أَنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَيُؤۡمِنُواْ بِهِۦ فَتُخۡبِتَ لَهُۥ قُلُوبُهُمۡۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٤﴾ وَلَا يَزَالُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي مِرۡيَةٖ مِّنۡهُ حَتَّىٰ تَأۡتِيَهُمُ ٱلسَّاعَةُ بَغۡتَةً أَوۡ يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابُ يَوۡمٍ عَقِيمٍ ﴿٥٥﴾

﴿٤٨﴾ خۆزۆر وڵات بوون لەگەڵ ئەوەیشدا كە ستەمكار بون ماوەم پێداوون بەڵام ئەوان لەوماوە پێدانەدا لەجیاتی بە خۆدا چونەوەو تەوبەكردن، تاوان‌و خراپەی زیاتریان كرد، پاشان غەزبم لێ گرتن‌و تەفروتونام كردن، وە گەڕانەوەیش هەر بۆلای منە. واتە: هەرچی ئەبی ببەو هەرچی ئەكەیت بیكەو هەر چەند ئەژیت بژی هەر ئەبێ بێیتەوە بۆ لام‌و حیسابت لەگەڵدا بكەم، جا خۆشبەختی بۆ ئەو كەسەی كە پێش ئەوەی بگات بەو حیسابە خۆی ئامادە ئەكات‌و لە هەمو تاوانی پەشیمان ئەبێتەوەو تێشوی چاك‌وپاك ئامادە بۆ ئەو رۆژە تەرخان دەكات.

﴿٤٩﴾ئەی محمدﷺبێژە ئەی خەڵكینە من بۆ ئیوە هەر تەنها ترسێنەریك‌و رۆشنكەرەوەیەكم كە لەسزای پاشەرۆژ ئەتان ترسێنم‌و هەمو راست‌وناڕاستێكتان بۆ رۆشن دەكەمەوە.

﴿٥٠﴾ جا ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوەو ئیشی چاكیان كردوە بۆ ئەوانە هەم لێخۆشبون‌و هەم رزق‌و رۆزیەكی بەڕێزو شەرافەتمەندانە هەیە.

﴿٥١﴾ئەوسا ئەوانەی كە هەوڵیان داوە دژایەتی نیشانەكانی ئێمە بكەن‌و پێیان وابوە كە دەشتوانن بە راستی ئەمانە زۆر لە هەڵەدا بون‌و بەدەستی خۆیان ماڵی خۆیانیان رماند، چونكە ئەوانە دۆزەخین‌و تەنها دۆست‌و یاری ئەوان ئاگری جهەنمەو ئەبێ لەوێدا بۆ هەمیشە جێگیر ببن.

ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡۚ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ قُتِلُوٓاْ أَوۡ مَاتُواْ لَيَرۡزُقَنَّهُمُ ٱللَّهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٥٨﴾ لَيُدۡخِلَنَّهُم مُّدۡخَلٗا يَرۡضَوۡنَهُۥۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَعَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿٥٩﴾ ۞ ذَٰلِكَۖ وَمَنۡ عَاقَبَ بِمِثۡلِ مَا عُوقِبَ بِهِۦ ثُمَّ بُغِيَ عَلَيۡهِ لَيَنصُرَنَّهُ ٱللَّهُۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٞ ﴿٦٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَأَنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٦٢﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَتُصۡبِحُ ٱلۡأَرۡضُ مُخۡضَرَّةًۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ﴿٦٣﴾ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٦٤﴾

﴿٥٢﴾ پێش تۆ هیچ ڕەسولو نەبییەکمان ڕەوانە نەکردوە مەگەر هەر کاتێ ئاواتی خواست بێت شەیتان شتێکی هاوێشتوەتە ناو ئارەزۆکەی. جا چونکە ئەمانە نمایندەو نوێنەری الله بوون، الله ئەوانی پاراستوە لەو بەشە شەیتانیەو ئاگاداری کردونەتەوە لێی، ئەوسا الله ئەوەی کە شەیتان فڕەی داوەتە ناو ئاواتەکانیەوە لای بردوەو پاشان نیشانەکانی خۆی پتەوو بەهێز کردەوە و الله زاناو کار بەجێیە. الله ماوەی بەپێغەمبەرانی داوە کە ئیجتهاد بکەن هەر وەك بەهەمو زانایان ئەو ماوە دراوە بەڵام پێغەمبەران لەم ئیجتهادانەدا وەك خەڵکی تر نین، چونکە ئەوان ئوسوەو چاولێکروا بون بۆ خەڵكو پێویستە لە هەمو بڕیارێکیاندا گوێڕایەڵیان لێ بکرێت، جا هەر کاتێك لە ئیجتهادێکدا نەیان پێکا بێت الله زووبەزوو ئاگاداری کردونەتەوەو بۆیانی ڕاست کردوەتەوەو نەیهێڵاوە کە لە سەر ئەوە بیمێننەوە، جا ئەم بەشەیە بووە بە هۆی تاقیکردنەوەی خەڵك ئەوسا باوەڕداری ڕاستەقینە باوەڕیان پێهێناوەو ئەو ڕاستکردنەوەیشیان بە حەقو ڕاست زانیوە، بەڵام دووڕوانو دڵبەزیوانو ساختەچیان زۆر جار ئەمەیان بە فرسەت زانیوە بۆ دژایەتیو بۆ بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرﷺ، بارمتە وەرگرتنی پێغەمبەرﷺ لە دیلەکانی "بەدر"و پشت هەڵچەرخاندنی لەو کوێرەی کە پرسیاری لێکرد کە باسی لە سورەتی (عەبەسە)دا هاتوە نمونەی ئەوئیجتهادا نە بووە کە الله ڕەخنەی توندی لێگرتووەو بۆی ڕاستکردوەتەوە، وە ئەم ئایەتانەش نمونەیەکن لەم بابەتە، پێغەمبەرﷺ ئەوندە ئاواتو ئارەزۆی موسڵمانبونی گەلەکەی هەبو کە هەندێ جار ئەهات بە دڵیا کەمێك نەرمیو بێدەنگی بەرامبەر بە بتەکانیان بنوێنێت تا بەڵکو بەرەو ئایینی ئیسلام بیان کێشێتو موسڵمان ببن بەڵام الله لۆمەی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡلَآ أَن ثَبَّتۡنَٰكَ لَقَدۡ كِدتَّ تَرۡكَنُ إِلَيۡهِمۡ شَيۡـٔٗا قَلِيلًا ﴾ الإسراء: ٧٤/ بەڕاستی ئەگەر ئیمە تۆمان بتەوو دامەزاو نەکردایە نزیك بو کە مەیلی دڵ بکەیت بۆلایان. جا دەگونجێت شەیتان لەوکاتانەدا خۆی تێهەڵقورتانبێتو ئاواتی خۆی بە گوێی کافراندا دابێت بەبێ ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ ئاگای لێ بێت بەڵام اللهی زاناو کاربە جێ نیشانەکانی خۆی بۆ پێغەمبەرەکەی ڕەوانە کردوەو فڕوفێڵی شەیتان وشەیتان سیفەتانی هەڵوەشاندوەتەوە. جا سوودی ئەم جۆرە ڕوداوانە چییە؟ دەفەرموێ:

﴿٥٣﴾ تا الله ئەوەی کە شەیتان خستویەتیە ناو ئاواتو ئارەزۆکانی ئەوانەوە بیکات بە تاقیکاریو بەڵایەك بۆ ئەوکەسانەی کە لە ناودڵیاندا نخۆشی کوفرو دوودڵی هەیە، وە بۆ دڵڕەقانیش. جا بێگومان ستەمکاران لەو پەڕی خراپیو کەللە ڕەقیدان لە دژایەتی اللهو ئایینو پێغەمبەرەکەیداﷺ.

﴿٥٤﴾ جا تا ئەوانەی کە خاوەنی زانیارین بزانن کە بێگومان ئەم قورئانە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارتەوەیە ئەوسا باوەڕی پێ ئەکەن، خۆ ئیتر دڵیان بۆی گەردنکەچو ڕام دەبێت، جا بێگومان الله ئەو کەسانەی کە باوەڕی ڕاستیان هێناوە ڕینماییان ئەکات بۆ ڕێگای ڕاست، ئەو ڕێگایەی کە مرۆڤ ئەگەیەنێ بە ڕەزامەندی اللهو بەهەشتی هەتاهەتایی کە پەیڕەوی ئەم قورئانەو شارەزا بونە لەم ئایینە.

﴿٥٥﴾ ئەوسا ئەوانەی کە بێباوەڕبون هەروا بە گومانن لەو قورئانە تا قیامەت یان تا ئەو کاتەی کە سزای ڕۆژی لەناوچونو بێخەیر یەخەیان ئەگرێت ئەو کاتە بە هۆش دێنەوەو دڵنیادەبن کە ئەم قورئانە ڕاستە بەڵام ئەو هۆشیار بونەوە تازە چ سودێکیان پێدەگەیەنێت؟

﴿٥٦﴾ دەسەڵاتو موڵك لەو ڕۆژەدا تەنها بۆ الله یەو لە نێوانیاندا بڕیار ئەدات، جا ئەوانەی کە باوەڕی ڕاستیان هیناوەو کاری چاکیان کردوە لەناو باغەکانی نازو نیعمەتدا کەیفخۆشو شادمانن.

﴿٥٧﴾ خۆ ئەوانەی کە بێباوەڕ بوونو نیشانەکانی ئێمەیان بەدرۆ ئەخستەوە ئەمڕۆ ئەوانن کە سزایەکی زەبون کەرو ئابڕوبەریان

بۆ هەیە. لەئایەتی پەنجاودوو تا ئیرە قسەو قالەی زۆری لە سەر کراوەو داستانی غەرانیق ئەم دیو ئەودیو کراوە، هەندێك بەراستی نازانن لەوانە( فخري رازي، فرط ، ظلال، روحا ما ، **کشف الاسرار و نصب المانيق لنسف قصة الغرانيق)** هەندیکیش بە راستی ئەزانن بەڵام ئەوانیش لە سەر چونیەتیەکەی ناکۆکن، جا ئەو قسەیەی ئەشێ بۆ باس کردنو رێی تێدەچێت ئەوەیە کە لە کاتی خوێندنەوەی سورەتی (نەجم) لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺبۆ ئەو خەڵکەی دانیشت بون لە باوەڕدارو کافر کاتێ کە پێغەمبەر ﷺسەرزەنشتی کردنو بتەکانی بە سوك ناو بردن وچانێکیدا شەیتان لە سەر شێوەی دەنگی پێغەمبەر تاریفی بتەکانی کردو وتی : ئەو بتانە باڵندە گەلێکی بەرزو تیژ فڕنو بێگومان شەفاعەتو تکاکاریان جێگای ئومیدە. جا بێباوەڕان ئەمەیان بیست وتیان محمد تاریفی بتەکانی ئێمەی کردووە بەمە شادمانو کەیفخۆشبونو لەکۆتایی سورەتەکەدا کاتێ کە پێغەمبەرﷺسوجدەی بردووە موسڵمانو بت پەرست هەموویان سوجدەیان بردووە، جا وا بڵاوبویەوە کە محمدﷺو قورەیش رێکەوتون تەنانەت ئەم دەنگوباسە بە حەبەشەیش گەیشتو کۆمەڵێك لەکوچکەرانی حەبەشە هاتنەوە بۆ مەکە بەڵام کە گەیشتنە مەکە دییان ئەو دەنگوباسە بەو شێوەیە نەبوە، لە راستیدا ئەم روداوی "غەرانیق"ـە سابت نەبوە ئەگەر سابتیش بێت وەك هەندێ وتویانە ناگونجێت کە بە دەمی پێغەمبەرداﷺ ئەو وشانە هات بێت وە ئەوەی کە دەگونجێت ئەوە بو کە باسمان لێکرد بێگومان هەر مرۆڤێکی ژیرو زانا تەماشای ئایەتەکانی سورەتی (نەجم) بکات کە سەراپا سوکیو بێنرخی کردنە بە بتەکان دەزانێت ئەو تاریفە لە زمانی پێغەمبەرەوەﷺنەبووەو ناگونجێ. والله اعلم. ئینجا پەروەردگار باسی ئەو کەسانە ئەکات کە لە بەر خاتری ﷲ جێگاو وڵاتی خۆیان بە جێ هێشتووەو ئەفەرموێ:

(٥٨) جا ئەوانەی کە لە ریگای ﷲدا کۆچیان کردووەو وڵاتی خۆیان بەجێ هێشتوە پاشان بکوژرێن یان بمرن هیچ جیاوازی نیە بە راستی ﷲ رۆزیان پێ ئەدات بەرۆزییەکی جوان چونکە ئەوان بۆ خوا وازیان لە ژیانی خۆشو وڵاتی خۆیان هێناوە خۆ بێگومان هەرﷲیشە چاکترینی رۆزیدەرەکانە، جا چۆن دەگونجێ بۆ ئەم زاتە دۆستانی خۆی بێ بەش بکات؟ سەرەرای ئەوەش ،

(٥٩) بە دڵنیاییەوە ئەیانباتە جیگایەکیشەوە کە خۆیان پێی رازی دەبن، بێگومان کەﷲ هەر زۆر زانایە بەکارو کۆششی بەندەکانی لە چاکو خراپ، بە حەوسەڵەیە بۆیە پەلە ناکات لە تۆڵە سەندنەوە، ئەگەر چی ئەو زاتە زۆر بەچاکی دەزانێت کە بەندەکانی چی دەکەن بەڵام بە حەوسەڵەیە بۆ تۆڵەسەندنەوە، پاكو بێ گەردی هەر بۆ ﷲیە لەو حەوسەڵە گەورەییەی پاش ئەو زانیاریە وردەی.

(٦٠) بریاری ﷲ ئاوەهایە، وە هەر کەسێك تۆڵەی خۆی بسێنێتەوە بەو شێوەی کە ستەمی لێکراوە پاشان دەست درێژی کرایە سەری بەراستی ﷲ یارمەتی ئەو کەسە ئەدات، بێگومان ﷲ زۆر چاوپۆشیکەرەو تاوان بەخشە، جا ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێت کە ئەبێ دەسەڵاتداران تۆڵە وەرگرنەوە بۆستەم لێکراوانو پشتگوێیان نەخەن.

(٦١) ئەوە برِیاری ﷲ یە کە باسکرا و ئەو هەرچی ببیەوێت دەیکات، چونکە بێگومان هەر ﷲ یە کە شەو ئەخاتە ناو رۆژو رۆژ ئەخاتە ناو شەوەوەو بە گوێرەی پێویستی خەڵك زیادو کەمیان ئەکات خۆ بێگومان خوا بیسەری هەمو قسەکانە ئاشکرا بێت یان شاراوەو بینەری هەمو کردارەکانە لە هەر کوێدا بکرێت بەشەو بێ یان بەرۆژ.

(٦٢) ئەوەیە برِیارو هێزی ﷲ چونکە هەر ﷲیە پەرستراوی حەقو راست، وە ئەوەی کە ئێوە بێجگە لەو دەیپەرستن پروپوچو بێ کەڵکنو پەرستنیشیان بێسودە خۆ بێگومان هەر خۆیەتی باڵا دەستو گەورە، جا بۆ بەڵگەیەك لە سەر باڵا دەستیو گەورەیی ئەفەرموێ:

(٦٣) ئەی نەت دیوە کە بێگومان ﷲ لە ئاسمانەوە ئاوی ناردو ئەوسا زەوی بە هۆی ئەوەوە سەوز بو؟ بێگومان کە ﷲ وردبینەو ئاگادارە بەسەر هەمو شتێکدا.

(٦٤) ئەوەی لە ئاسمانانو زەویدایە هەموی موڵکی ئەوە ئەوسا بێگومان کە ﷲ خۆی لە هەمو شت بێ نیازەو هەمیشەسوپاس دەکرێت.

(٦٥) ئایا نابینی کە ﷲ ئەوەی کە لەناو زەویدایە دەستەمۆو رامی کردوە بۆتان، تا هەر شتێك بە گوێری خۆی سودی لێ وەربگرن، وە تۆ نابینیت ئەو کەشتیە گەورەو بار قورسانەی بۆ رامکردون کە بە فەرمانی خۆی هێزێکی وای لەناو ئەو دەریادا داناوە کە راگیری بکاتو بەئاسانی هاتو چۆی تێدا بکات، وە ئەم ئاسمانەی راگرتوە کە بەسەر زەویدا نەکەوێت مەگەر خۆی رێیی پێ بدات، بێگومان ﷲ سەبارەت بە خەڵك زۆر دڵسۆزو بە رەحمە هەرچەند کە ئەوان ستەمکارن.

(٦٦) ئەوسا هەر خۆیەتی کە ژیانی پێداونو ئەتان ژێنێ پاشان ئەتان مرێنیو کەس ناتوانێ رێگای لێ بگرێت، پاش ئەوەیش

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ وَٱلْفُلْكَ تَجْرِي فِي ٱلْبَحْرِ بِأَمْرِهِۦ وَيُمْسِكُ ٱلسَّمَآءَ أَن تَقَعَ عَلَى ٱلْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِۦٓۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِٱلنَّاسِ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٦٥﴾ وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْۗ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ لَكَفُورٞ ﴿٦٦﴾ لِّكُلِّ أُمَّةٖ جَعَلْنَا مَنسَكًا هُمْ نَاسِكُوهُۖ فَلَا يُنَٰزِعُنَّكَ فِي ٱلْأَمْرِۚ وَٱدْعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ إِنَّكَ لَعَلَىٰ هُدٗى مُّسْتَقِيمٖ ﴿٦٧﴾ وَإِن جَٰدَلُوكَ فَقُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٦٨﴾ ٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٦٩﴾ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِۗ إِنَّ ذَٰلِكَ فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٧٠﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنٗا وَمَا لَيْسَ لَهُم بِهِۦ عِلْمٞۗ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٖ ﴿٧١﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱلْمُنكَرَۖ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِٱلَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَاۗ قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكُمُۗ ٱلنَّارُ وَعَدَهَا ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۖ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٧٢﴾

زیندوتان ئەکاتەوە بۆ پاداش‌و سزای ئەوەی کە کردوتانە بەراستی مرۆڤ زۆر خوانەناس‌و ناسوپاس‌و سپڵەیەو ئەو هەمو نازو نیعمەتانەی لەبەر چاو نیەو لەباتی مەدح‌و سوپاسی اللّٰه دژایەتی‌و کوفری ئەکات‌وبەندەی ئەو بەخوای خۆی دەکات؛

﴿٦٧﴾ بۆ هەمو گەل‌و زەمانێك یاساو بەرنامەیەکمان داناوە کە ئەوان ئەبێ بەو شێوە ڕەفتار بکەن. واتە ئەم بەرنامەی تۆ شتێکی بێ وێنەو داهاتو نیە، بەڵکو درێژەی بەرنامەی گەلانی پێشوە، دەی با ئەوان لەم کارەدا بگرەو بەردەت لەگەڵ دا نەکەن‌و بەڵکو ژیربن‌و دان بەراستی‌دا بنێن جا تۆ ئەی محمدﷺ بەرەوە پەروەردگاری خۆت بانگ بکە ئیتر ئەوانیش چی دەڵێن با بڵێن بەراستی تۆ لە سەر ڕێنمای‌و ڕێگای ڕاستیت.

﴿٦٨﴾ جا ئەگەر دەمەقاڵەیان لەگەڵ دا کردیت لە سەر ئەو یاساو بەرنامەیانەی کە بۆمان داناون تۆ خۆگرو لێبوردەبە، جا تۆ بڵێ: اللّٰه زاناترە لە خۆیشتان بەوکارو ڕەفتارانەی کە ئەیکەن دەرحەق بەمن.

﴿٦٩﴾ جااللّٰه لە ڕۆژی قیامەتدا لە بارەی ئەوەی کە ئێوە کێشەتان تێدا هەیە بڕیار ئەدات لە نێوانتانداو ڕاست‌و ناڕاستتان بۆ دەر ئەخات. دیارە اللّٰه بۆ هەمو ئومەتانی پێشو بەرنامەو پەیڕەوو پرۆگرامێکی تایبەت‌و گونجاو بۆ کاتی خۆیانی ناردوە، ئەگەر چی لە ئەسڵ‌و بنەمادا هەمویان وەك یەکن‌و گۆڕانکاری تێدا نەکراوە ئەمە جێی ڕەخنەگرتن نیە، بەڵام کەسانێك هەن کە ئەگەر چی لەگەڵ ئەسڵی پەیامی پێغەمبەرﷺکیشەیان هەیەو باوەڕیان پێی نیە، ئەیانەوێت بە عەقڵی کورتی خۆیان ڕەخنە لە ئەحکامە شەرعیەکان بگرن وەك ئەوەی کە ئەڵێن: کڕین‌و فرۆشتن هەروەك سوو (الربا) وایە، جا ئەگەر سوو حەرام بێت ئەبێ کڕین‌و فرۆشتنیش حەرام بێت، جا ئەم ئایەتانە ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە ئەبێت پێش هەمو شتێك ئەمانە بۆ ڕێگای اللّٰه و باوەڕ هێنان بە ئەسڵی پەیامی پێغەمبەرﷺبانگ بکرێن، جا ئەگەر باوەڕیان هێنا ئەوسا کێشە نامێنێت، چونکە بۆچونی باوەڕدار وایە کە ئەوەی پێغەمبەرﷺوتویەتی هەموی لە لایەن زاتێکەوەیە کە هەمو بڕیارەکانی حەق‌و بەجێیە بەڵام ئەگەر باوەڕیان نەهێنا ئێوە خۆتان بە کێشەو دەمەقاڵە کردن لە گەل ئەواندا سەرقاڵ مەکەن، چونکە ئەمانە لەم دەمەقاڵەدا ئاماجیان ئەوە نیە کە حەق‌و ڕاستیان بۆ دەرکەوێت، چونکە ئەگەر مەبەستیان دۆزینەوەی حەق بوایە لە ئەسڵ‌و بناغەی پەیامەکەوە دەستیان پێدەکرد، هەروەها ئەوەیشمان تێدەگەیەنێت کە دەمەقاڵە کردن وەسفێکی پەسەند کراو نیە بۆیە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { **أنا زَعِيمٌ بِبَيْتٍ فِي رَبَضِ الْجَنةِ لِمَنْ تَرَكَ الْمِرَاءَ وَإِنْ كَانَ مُحِقًّا وَبِبَيْتٍ فِي وَسَطِ الْجَنةِ لِمَنْ تَرَكَ الْكَذِبَ وَإِنْ كَانَ مَازِحًا وَبِبَيْتٍ فِي أَعْلَى الْجَنةِ لِمَنْ حَسنَ خُلُقُهُ/** واتە: من زەمانەتی ماڵێك دەکەم لە داوێنی بەهەشتەوە بۆ ئەوکەسەی کە وازی هێنابێت لە دەمەقاڵە ئەگەرچی قسەکەیشی ڕاست بێت، وە ماڵێك لە ناوەڕاستی بەهەشتدا بۆ کەسێك کە وازی لە درۆ هێنابێت ئەگەرچی بە شۆخیش بێت، وە ماڵێك لە لای سەروی بەهەشتدا بۆ ئەوکەسەی کە ڕەوشتی خۆی جوان کردبێ}

﴿٧٠﴾ ئایا تۆ نازانی کە بە ڕاستی اللّٰه ئەوەی کە لە ئاسمان‌و زەویدایە ئەیزانێ؟ بێگومان ئەوەش هەموی تۆمارکراوە لەناو کتێب دا بێگومان ئەوەیش لەلای اللّٰه ئاسانە،

﴿٧١﴾ خۆ موشریکان جگە لە اللّٰه شتێك ئەپەرستن کە پەروەردگار هیچ بەڵگەیەکی لەسەر ڕاستی ئەو ڕەوانە نەکردووەو هیچ زانیارییەکیشان لەو بارەیەوە نییە، دەی ئەو جۆرە پەرەستنە جگە لە نەفامی ئەبێ چی بێت؟ کەواتە ئەوانە ناحەقیکارو ستەمکارن جا بۆ ئەو ستەمکارانە هیچ یارمەتی دەرێك نییە کە بیانپارێزێ لە سزای اللّٰه . بەڵێ ئەم بێباوەڕو گەوجانە هەرگیز پێیان خۆش نیە کەنیشانەکانی خوا ببینن‌و شەیتان سواری شانیان بوەو ڕەوای لە لا کردوون بە ناڕەواو ناڕەوایشی لا کردون بەڕەوا و سەری لێ تێکداون.

﴿٧٢﴾ خۆ هەر کاتێك ئایەتە ڕۆشنکەرەوەکانی ئیمەیان بە سەردا بخوێنرێتەوە تۆ هەر بە چرو چاوی ئەو بێباوەڕانەدا بێزاریو

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٞ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَن يَخۡلُقُواْ ذُبَابٗا وَلَوِ ٱجۡتَمَعُواْ لَهُۥۖ وَإِن يَسۡلُبۡهُمُ ٱلذُّبَابُ شَيۡـٔٗا لَّا يَسۡتَنقِذُوهُ مِنۡهُۚ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ ﴿٧٣﴾ مَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ﴿٧٤﴾ ٱللَّهُ يَصۡطَفِي مِنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلٗا وَمِنَ ٱلنَّاسِۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعُۢ بَصِيرٞ ﴿٧٥﴾ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۗ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٧٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ۩ ﴿٧٧﴾ وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ﴿٧٨﴾

٢٣ سُورَةُ المُؤۡمِنُونَ ١١٨

رقی ئەوانت لەم ئایینە بۆ دەردەكەوێت، بەڵكو لەو كاتەدا ها خەریكن هێرش بكەنە سەر ئەو كەسانەی كە ئایەتەكانی ئێمەیان بەسەردا دەخوێننەوە، ئەی محمدﷺ بەوانە بڵێ: ئایا هەواڵتان پێبدەم بە شتێك خراپتر لەو رقو قینەی ئێوە؟ ئەو ئاگرە سەختو دژوارەیە كە الله بەڵێنی پێداوە بۆ ئەوانەی كە بێباوەڕ بوون كە زۆر گەورەو بە ئێشو ئازارترە لەو كارانەی كە ئەوان دژی باوەڕداران دەیان كرد. جا ئا ئەمەیە سەر ئەنجامی پیسو بەد فەڕ، ئینجا الله باسی لاوازی ئەو پەرستراوانەو گێلی بەندەكانیان دەكاتو دەفەرموێ:

(٧٣) ئەی خەڵكینە نمونەو پەندێك هێنراوە، جا باش گوێی لێ رابگرن تا خوا تاشراوو درۆزنە كانتان چاك بناسن، بێگومان ئەوانەی كە ئێوە جگە لە الله هانایان بۆ ئەبەنو ئەیانپەرستن، ئەگەر هەمویشیان كۆ ببنەوە هەرگیز مێشێكیان پێدروست ناكرێت، جا نەك هەرگیز پێیان دروست ناكرێت بەڵكو ئەوەندە بێ نرخو لاوازن ئەگەر مێشێك شتێكیان لێ بفڕینێ ناتوانن لێی بسێننەوە. ئای داوا كار كە پەرستراوە ناحەقەكانەو داوا كراو كە مێشەكەیە، چەند لاوازو بێ هێزن، دەی پەرستراوانێك كە بە هەمو یانەوە نەتوان مێشێك دروست بكەن وەیان دەرەقەتی مێشێك نایەن چۆن چاوەڕوانی شەفاعەتو تكاكاریان لێ دەكرێت، دەی ئامۆژگاری لەمە گرنگتر كوا؟ بۆ بیر ناكەنەوەو دەست لەخەرافاتو خوایانی تاشراو هەڵگرنو روكەنەوە پەروەردگاری جیهان خۆ هەرچی بكەن هەردەچنەوە بەردەستی؟

(٧٤) ئەوانە اللهیان بەو شێوەی كە شیاواو پێویست بێ نەناسیوەو رێزیان بۆ دانەناوە بێگومان كە الله ئەوپەڕی تواناو دەسەڵاتی هەیەو هەمیشە سەركەوتوەو هیچ شتێك بە سەریدا زاڵ نابێت.

(٧٥) الله لە ناوفریشتەكانو لە ناوخەڵكدا نمایندەو نێرراوانی خۆی هەڵدەبژێرێ بێگومان كە الله زۆر بیسەروبینەرە، هیچ دەنگێك نیە كە نەیبیسێو هیچ شتێك نیە كە نەیبینێ.

(٧٦) ئەو زاتە بەوەی كە ئێستا لەبەردەمیاندایە لەخۆشیو ناخۆشی لەچاكو خراپ و بەوەیش كە لەمەولا پێی دەگەن دەزانێ ئەوسا هەر بۆلای الله رەوانە دەكرێنەوە.

(٧٧) ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە گەردنكەچ ببنو سوجدە بەرنو پەروەردگارتان بپەرستنو ئیشی چاك بكەن بۆ ئەوەی سەر كەوتو رزگار ببن لە دنیاو لە پاشە رۆژدا.

(٧٨) جیهاد بكەن لە رێگەی اللهدا بەو شێوەیەی كە شایەستەی ئەو زاتەیە كە ئەو ئێوەی هەڵبژاردوە بۆ ئەم ئاینەو كردونی بە هەڵگرانی راستەقینەیو هیچ شتێكی سەختی لەم ئاینەدا لەسەر ئێوە دانەناوە، پەیڕەوی ئاینی باوكی خۆتان ئیبراهیم بكەنو هەڵگری ئاڵای یەكخواپەرستیبن وەك باوكتان ئیبراهیم، ئەو زاتە لە پێش قورئانو لەم قورئانەیشدا ناوی ئێوەی بە موسڵمان بردوە تا پێغەمبەر ﷺ شایەت بێت لە سەر ئێوە، جا ئێوەش شایەت بن لەسەر خەڵك، دەی ئێوە نوێژ بكەنو زكات بدەنو دەست بە ئایینی اللهوە بگرنو بەراستی بچەسپێن پێیەوە هەر ئەو زاتەیە دۆستی ئێوە ئای چ دۆستێكی بەهێزەو چ یارمەتی دەرێكی هەرگیز نەشكاو.

لێرەدا فەرموی لە ئایینەدا سەختیو گرانی نیە بەڵام ئەمە بەو مانا نیە كە لە ئایینەدا هیچ ناڕەحەتیەك نیە بەڵكو مانای ئەوەیە كە كارەكانی ئایینی هەموی بە سودی باوەڕدارەو ئەنجامدانیان لە چاو پاداشە زۆرو نەبڕاوەكانیدا هەر چەند قورسیش بن وەزنو ناڕەحەتیەكیان نیە، ئەمە لە لایەكەوە لە لایەكیترەوە ئەنجام نەدانی فەرمانەكانی ئایین ئەوەندە سزاكەی زۆرو نەبڕاوەیە ئەنجامدانیان هەرچەند سەخت بێ زۆر ئاسانە لە چاو ئەو سزا زۆروگەورەو نەبڕاوەدا لە روویەكی ترەوە داواكارییەكانی ئایین بە ئەندازەی توانایی مرۆڤەو هیچی لە توانا بەدەری تێدا نیەو نابێ، ئەمە گرنگەو چاكی وەرگرە بۆ شوێنەكانی تری لەم بابەتە، بەڵێ ئەم ئاینە بەئیسلامو پەیڕەوانی بەموسڵمان ناونراوە واتە: بەكەسێك ئەوترێت موسڵمانە كە خۆی بەتەواوی دابێتە دەستاللهو گوێ رایەڵومل كەچی فەرمانەكانی بێت لە هەر كوێدا بێو هەر رەنگوزمانێكی هەبێت ئەگەر وانەبو بە پەیڕەوی ئەم ئاینە دانانرێت هەر كەسێك بێو لە هەر كوێدا بێو هەرجۆرە رەنگوزمانێكی هەبێت، وە بەناوی تیرەوو نەژادو وڵاتو پێغەمبەرەوە ناو نەنراوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ
قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ﴿٢﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ ﴿٣﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ ﴿٤﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ ﴿٥﴾ إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ ﴿٦﴾ فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ ﴿٩﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿١١﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن طِينٖ ﴿١٢﴾ ثُمَّ جَعَلۡنَٰهُ نُطۡفَةٗ فِي قَرَارٖ مَّكِينٖ ﴿١٣﴾ ثُمَّ خَلَقۡنَا ٱلنُّطۡفَةَ عَلَقَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡعَلَقَةَ مُضۡغَةٗ فَخَلَقۡنَا ٱلۡمُضۡغَةَ عِظَٰمٗا فَكَسَوۡنَا ٱلۡعِظَٰمَ لَحۡمٗا ثُمَّ أَنشَأۡنَٰهُ خَلۡقًا ءَاخَرَۚ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٤﴾ ثُمَّ إِنَّكُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ لَمَيِّتُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ تُبۡعَثُونَ ﴿١٦﴾ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا فَوۡقَكُمۡ سَبۡعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ ٱلۡخَلۡقِ غَٰفِلِينَ ﴿١٧﴾

## ٢٣ سورەتی موئمینون ١١٨

سورەتی موئمینون بیستوسێ هەمین سورەتی قورئانەو سەدوهەژدە یان نۆزدە ئایەتە، لەسەر رای ئەوانەی کە لەسەر ﴿وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ﴾ ئایەتی چلوپێنج وەستاون کە بەسریەکانن سەدونۆزدەیە وە ئەوانەیش کە لەسەری نەوەستاون کە کوفیەکانن سەدو هەژدەیەو قسەی هەمو لەسەر ئەوەیە کە لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە.

عەبدوڵای کوڕی سائیب ﷺ دەگێڕێتەوە کە { حَضَرْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَوْمَ الفَتْحِ فَصَلى فِي قُبُلِ الكَعْبَةِ فَخَلَعَ نَعْلَيْهِ فَوَضَعَهُمَا عَنْ يَسَارِهِ فَافْتَتَحَ بِسُورَةِ المُؤْمِنِ فَلما جَاءَ ذِكْرُ مُوسَى أَوْ عِيسَى عَلَيْهِمَا السلام أَخَذَتْهُ سَعْلَةٌ فَرَكَعَ/النسائي، صححه الألبا / لە گەڵ پێغەمبەردا ﷺ رۆژی فەتحی مەکە ئامادەبوم جا پێغەمبەرﷺ لەبەردەمی کەعبەدا نوێژی خوێند، هەردوو نەعلەکەی لە پێ کەندو لە لای چەپیەوە دایان، ئەوسا دەستی بە خوێندنی سورەتی موئمینون کرد جاکاتێك کە گەیشت بە باسی موسا یان عیسا کۆکە گرتیو لەبەر ئەوە چو بە رکوعدا} وتراوە ئەم سورەتە بەگوێرەی دابەزین سورەتی حەفتاو شەشەمەو پاش سورەتی (الطور) و پێش (الملك) دابەزیوەو بەباسکردنی سیفەتەکانی باوەڕداری راستەقینە دەست پێدەکات، لە کۆتای سورەتی پێشو کە سورەتی حەجە فەرمان بەچاکە کردن دراو فەرموی: ﴿وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ﴾ الحج: ٧٧.

جا لێرەشدا بەدرێژە باس لەو چاکانەدەکات.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بەراستی باوەڕداران سەرکەوتو رزگارن. جا لێرەدا چەند وەسفێکی ئەو باوەڕدارە سەرکەوتوانە باس دەکات و دەفەرموێ:

(٢) ئەو کەسانەن کە لەناو نوێژەکانیاندا خۆیان بە کەم دەگرن‌و بە دڵەوە بە نوێژەکەوە خەریکن‌و خۆیان بە شتی ترەوە خەریك ناکەن، واتە: خشوع هەم کاری دڵەو هەم کاری ئەندام.

(٣) جا ئەوکەسانەن کە خۆیان لە قسەی پڕوپوچ و نابەجێ دور دەگرن‌و خۆیان تێکەڵاوی ئەو کەسە خراپانە ناکەن، واتە: رەوشت بەرزن.

(٤) جا ئەو کەسانەن کە زەکات دەدەن، وە لە ماڵەکانیان مافی (ﷲ)و خەڵکیان هەمیشە لەبیرەو کەم تەر خەمی تێدا ناکەن، واتە: زۆر لە خواترس ومرۆڤ دۆستو خێر خوازن.

(٥) وە ئەو کەسانەن کە بە چاکی شەرمگەی خۆیان دەپارێزن لەکاری پیس‌و بێ شەرعی،

(٦) مەگەر لەگەڵ هاوسەرانی خۆیان یان ئەوکەنیزانەی کە موڵکی خۆیانن، جا بێگومان ئەوانە لەسەر تێکەڵاویی ئەم دووبەشە سەرزەنشت ناکرێن، چونکە کارێکی شەرعی‌و رەوایە بۆیان بەڵکو پاداشتیش دەدرێنەوە.

(٧) ئەوسا هەر کەسێك شەرمگەی خۆی بۆ جگە لەو دوو رێگا شەرعیە بەکار بهێنێت ئەوانە دەستدرێژیکەرو لە یاسا دەرچوون، کەوا بوو هەر کەس زینا بکات یان نێرباز بێت یان دەستپەڕی بکات وە یان لەکۆمەوە یان لەکاتی عادەی مانگانەوە یان کاتی پاش منداڵ بوون لە گەڵ خێزانیدا نزیکی بکات ئەو کەسە تاوانبارەو لە یاسا دەرچووە.

(٨) پاشان پەروەردگار لە وەسفی باوەڕداراندا دەفەرموێ: جا ئەوانەن کە پارێزەری ئەمانەتەکانیان‌و بەڵێنەکانیانن، نە خیانەت لە ئەمانەت دەکەن ونە بەڵێن دەشکێنن واتە ئەو دوو وەسفەی دووڕووەکانیان تێدا نیە.

(٩) خۆ ئەوانەیشن کە نوێژەکانیان دەپارێزن‌و هەریەکەی لە کاتی خۆیدا ئەنجام دەدەن، جا نوێژ ئەوەندە گرنگە کە (ﷲ) دووجارلێرەلە وەسفی باوەڕداراندا هێناویەتی جاری یەکەم لەبارەی خشوعەوەیە جاری دووهەم کەئێرەیە لە بارەی پارێزگاری لە سەری نویژو کاتەکانیەتی.بەڵێ، نوێژ زۆر گرنگە چونکە هێڵی پەیوەندی راستەو خۆی باوەڕدارە بە پەروەردگاری خۆی‌و جێگای رازو نیازیەتی.

(١٠) ئەوانەن میراتگران. پێغەمبەرﷺ دەفەموێ: {**مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا لَهُ مَنْزِلَانِ مَنْزِلٌ فِي الْجَنَّةِ وَمَنْزِلٌ فِي النَّارِ فَإِذَا مَاتَ فَدَخَلَ النَّارَ وَرِثَ أَهْلُ الْجَنَّةِ مَنْزِلَهُ فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى** ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ ﴾

/ابن ماجه، صححه الألبا / هیچ کام لە ئیوە نیە مەگەر دوو جیگای بۆ هەیە جێگایەك لە بەهەشتو جێگایەك لە ئاگری دۆزەخ، جا هەر کاتێك کە کافرێك دەمرێتو دەڕواتە ناو ئاگر، ئەوسا جێگای بەهەشتی ئەو کافرە بە ئەوانەی کە چونەتە ناو بەهەشتەوە دەدرێتو بۆخۆیان دەیبەن، جا ئەوە مەبەستە لەفەرمودەی خوای بەشکۆدا کە دەفەرموێ:﴿ ئەوانەن میراتگران ﴾ .

(١١) ئەوانەی کە فیردەوس بە میراتو ئیرس دەبەنەوە، ئەوان بۆ هەمیشە تێیدا دەمێنێنەوە، پێغەمبەرﷺ لە وەسفی فیردەوس دا دەفەرموێ: { **إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللَّهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ فَإِذَا سَأَلْتُمُ اللَّهَ فَسَلُوهُ الْفِرْدَوْسَ فَإِنَّهُ أَوْسَطُ الْجَنَّةِ وَأَعْلَى الْجَنَّةِ وَفَوْقَهُ عَرْشُ الرَّحْمَنِ وَمِنْهُ تَفَجَّرُ أَنْهَارُ الْجَنَّةِ**/ متفق علیه/ واتە : بێگومان لەناو بەهەشتدا سەد پلە هەیە کە ﷲ ئامادەی کردوە بۆ ئەو کەسانەی کە لە رێگای ئەو دا غەزا دەکەن نێوانی هەر پلەیەك بۆ پلەیەکی تر وەك نێوانی ئاسمانو زەوییە، جا هەر کاتێك داواتان کرد لەﷲ داوای فیردەوس بکەن کە بێگومان چاکترینو بەرزترین جێگەی بەهەشتە و لەسەر ئەوەوە عەرشی (ﷲ)یەو روبارەکانی بەهەشتیش لە وێوە هەڵدەقوڵێن }

(١٢) بەراستی ئێمە لە سەرەتاوە مرۆڤمان لە پوختەیەکی دەرهێنراو لە قوڕ دروستکردوە. سەرەتای دروستبونی ئادەم عليه السلام بەم شێوە بووە لە(خاك)ـەوە بۆ(قوڕ) ئینجا بۆ قوڕی بۆ گەنیوو ترشاو،جا قوڕی وشکەوە بو ئەوسا ئادەم عليه السلام. پاشان لە خۆی هاوسەری بۆ دروستکردو لەودووانەوە بەم شێوەیە کە دێت دروست بونی مرۆڤ دەستی پێکرد.

(١٣) پاشان کردمان بە تۆماو، وە ئەو تۆماوە دانرا لە ناو جێگەیەکی پارێزراودا کە رەحمی دایکە.

(١٤) پاشان ئەو تۆماوی شەهوەتەمان کرد بە پارچە خوێنێکی مەیو، ئەوسا ئەو خوێنە مەیوەمان کرد بە پارچە گۆشتێك بە ئەندازەی پارویەك، ئینجا ئەو پارچە گۆشتەیشمان کرد بە ئێسقان گەلێك، جا ئەو ئیسقان گەلەیشمان بە گۆشت داپۆشی پاشان کردمان بە دروستکراوێکی تر، جا بە هۆی پێدانی رۆحو گیانەوە، لە جیسمێکی بێ گیانەوە گۆڕیمان بۆ گیان لەبەرێك جا چ عەجایب دەست رەنگینو بولەند مەقامو بەخەیرو بەیرە (ﷲ)یەك کە باشترینی هەمو دروستکارانە.

وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءَۢ بِقَدَرٖ فَأَسۡكَنَّٰهُ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَإِنَّا عَلَىٰ ذَهَابِۭ بِهِۦ لَقَٰدِرُونَ (١٨) فَأَنشَأۡنَا لَكُم بِهِۦ جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ لَّكُمۡ فِيهَا فَوَٰكِهُ كَثِيرَةٞ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ (١٩) وَشَجَرَةٗ تَخۡرُجُ مِن طُورِ سَيۡنَآءَ تَنۢبُتُ بِٱلدُّهۡنِ وَصِبۡغٖ لِّلۡأٓكِلِينَ (٢٠) وَإِنَّ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَنۡعَٰمِ لَعِبۡرَةٗۖ نُّسۡقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهَا وَلَكُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ كَثِيرَةٞ وَمِنۡهَا تَأۡكُلُونَ (٢١) وَعَلَيۡهَا وَعَلَى ٱلۡفُلۡكِ تُحۡمَلُونَ (٢٢) وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥٓۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ (٢٣) فَقَالَ ٱلۡمَلَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيۡكُمۡ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ مَّا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ (٢٤) إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ (٢٥) قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ (٢٦) فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡهِ أَنِ ٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسۡلُكۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ مِنۡهُمۡۖ وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ (٢٧)

وشەی ﴿ ٱلۡخَلۡقُ ﴾ دوو مانای هەیە:

**یەکەم**: دروستکردنی شتێك لە نەبون(**العدم**) کە ئەمە هەر ئیشی (ﷲ)یەو جگە لەو لەم بارەوە هیچ دەسەڵاتێك نیەو خالیق هەر خوایە.

**دووهەم**: گۆڕانو دەستکاری کردنی شتێك بۆ دروستکردنی شتێکی نوێ وەك ئەوەی کە خاك دەکرێت بە قوڕ، ئینجا بە هەیکەل ئەمیش هەر خەلقی پێدەوترێت جا بەم مانایە دەتوانین بڵێین خالیقەکان زۆرن بەڵام ﴿ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ أَحۡسَنُ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴾ ﴿جا چ عەجایب بەخەیرو بەیرە (ﷲ)یەك کە باشترینی هەمو دروستکارانە﴾

(١٥) پاشان ئێوە بێگومان بن کە پاش ئەو دروستکردنەو تەواوکردنی ئەو ماوەیەی کە بۆ هەر کەسێك دانراوە، بەراستی ئێوە دەمرنو دەچنە دنیایەکی ترەوە.

(١٦) پاشانیش سور بزانن کە ئێوە رۆژی قیامەت زیندو دەکرێنەوە بۆ حیسابو پاداشت و تۆڵە.

(١٧) جا بە راستی ئاسمانانمان لە حەوت تەبەقە کە شوێنی هاتو چۆی فریشتەکانە لە ژورەوەی ئێوەوە دروستمان کردوە، وە ئێمە بێ ئاگانین لە ئەوانەی کە دروستمان کردوە، وە ئێمە هەروا دەستمان لێ نەشۆردون بەڵکو بونی هەمویان بە فەرمانی ئێمەیەو چاکیش دەزانین چی دەکرێتو چییان پێویستە.

فَإِذَا ٱسْتَوَيْتَ أَنتَ وَمَن مَّعَكَ عَلَى ٱلْفُلْكِ فَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى نَجَّىٰنَا مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٨﴾ وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِى مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلْمُنزِلِينَ ﴿٢٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ وَإِن كُنَّا لَمُبْتَلِينَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قَرْنًا ءَاخَرِينَ ﴿٣١﴾ فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِلِقَآءِ ٱلْءَاخِرَةِ وَأَتْرَفْنَٰهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَرًا مِّثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذًا لَّخَٰسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ ۞ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا وَمَا نَحْنُ لَهُۥ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٣٩﴾ قَالَ عَمَّا قَلِيلٍ لَّيُصْبِحُنَّ نَٰدِمِينَ ﴿٤٠﴾ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ بِٱلْحَقِّ فَجَعَلْنَٰهُمْ غُثَآءً ۚ فَبُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤١﴾ ثُمَّ أَنشَأْنَا مِنۢ بَعْدِهِمْ قُرُونًا ءَاخَرِينَ ﴿٤٢﴾

(١٨) خۆ ئێمە لە سەرتانەوە بە ئەندازەی دیاریکراوو پێویست ئاوتان بۆ دەبارێنین نە ئەوەندە کەم کە سودی نەبێ ونە ئەوەندەیش زیاد کە لە ناوتان ببات، جا ئێمە ڕاگیری دەکەین لە ناو زەویدا تا سودی لێ وەرگرن، وە بەڕاستی ئێمە- هەر وەکو دەیبارێنین هەروایش- زۆر بە توانایین کە لە ناوی ببەین ونەیهێڵین سودی لێ وەربگرن، واتە: ئەو ئاوەی کە هیچ گیانلەبەرێك بێ ئەو ژیانی نابێ دوو مەترسی گەورەی هەیە **یەکەم**: اللّٰه نەیبارێنێ کێ دەیبارێنێت. **دووەهەم**: ئەگەر باراندیشی زوو لە ناوی ببات چ بیکاتەوە بە هەڵم یان بەناخی زەویدا بیباتە خوارەوە کێ دەتوانێ ڕێگای لێ بگرێت ئەگەر سۆزو ڕەحمەتی خۆی نەبێ؟ ﴿ بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ئەو ئاوەی کە سەرچاوەی ژیانتانە بە ناخی زەویدا بچێتە خوارەوەو هیچی بۆ سەرنەیەت، ئەوسا کێیە کە ئاوی هەڵقوڵاو و کانی ئاوی بەتامو چاکتان لەناو ئەو خاکەدا بۆ دەردەهێنێت؟ ﴾ ملك/ ٣٠.

(١٩) جا بەو ئاوە باغەکانی خورماو ترێمان بۆ ئێوە بەدی هێناوە کە میوە جاتێکی زۆری تێدایە بۆتان وە لەوانە دەخۆنو دەبێ بە هۆی زیندەگیتان، جا هەر خورماو ترێ نیە بەڵام ئەم دوو میوە لەوانەیە کە بەبێ نان مرۆڤ دەتوانێت پێیان بژی و فەڕوسودێکی زۆریان تێدایە بۆیە بە تایبەت ناوی ئەو دوانەی بردوە.

(٢٠) ئەوسا لە چیای سینادا درەختێکی چاكو بەفەڕم بۆ ڕواندون کە ڕۆنی هەیە و پێخۆریشە بۆ بخۆران، واتە: زەیتون کە ڕۆنێکی زۆری هەیەو سودێکی فرەوانی لێ وەر دەگیرێو دەشخورێت کە ئیستا زانست گەلێك لە سودەکانی ڕۆنی زەیتونی زانیوە هەروەکو سودەکانی خورماو مێوژو کشمیش.

(٢١) بێگومان لەناو ئاژەڵەکانیش دەرسو ئامۆژگاریەکی یەکجار گەورەتان بۆ هەیە، ئێمە پێتان دەنۆشین لەوەی کە لەناو سکیاندایە کە شیرێکی پاكو خۆشمەزەیە، وە لەناو ئەو ئاژەڵەدا گەلێ سودی ترتان بۆ هەیە، وە لە گۆشتیشیان دەخۆن.

(٢٢) جا لەسەر هەندێکیان لەو ئاژەڵانەو لەسەر کەشتی هەڵدەگیرێنو بە هۆی ئەوانەوە ئازوگویاز دەکەن، ئەمانە هەموو نیعمەتی (اللّٰه)نو پێویستە مرۆڤ سوپاسگوزار بێت. ئینجا اللّٰه داستانی چەند پێغەمبەرێك بە شێوەیەکی کورت باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٣) بەڕاستی ئێمە (نوح)مان ڕەوانە کرد بۆ سەر گەلەکەیو پەیامی خۆمانمان پێدا نارد، جا ئەویش وتی: بە گەلەکەی: ئەی گەلی من اللّٰه بپەرستن، جگە لەو خوایەکی ترتان نیە وهیچ شتێك جگە لەو شایستەی پەرستن نیە دەی ئایا ئێوە هەروا لەسەر ئەوئیشە خراپانەتان دەڕۆنو ناترسنو خۆتان لە ڕقوقینی ئەو خوایە ناپارێزن؟

(٢٤) جا پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی کە بێباوەڕبون بەو گەلەی خۆیان وت: ئەمە جگە لەوەی کە مرۆڤێکە وەك ئێوە شتێکیتر نیە، دەیەوێ خۆی بەسەر ئێوەدا بەرز بکاتەوە، خۆ ئەگەر اللّٰه مەیلی ناردنی نمایندەی لێ بوایە بێگومان فریشتەکانی دەنارد، خۆ ئەوەی کە نوح باسی دەکات لە باو باپیرانیشمانەوە نەمان بیستوە.

(٢٥) ئەمە جگە لەوەی کە پیاوێکی شێتە شتێکی تر نیە، جا لێی بوەستن هەتا ماوەیەك یان چاك دەبێتەوە یان هەمو کەس دەزانێت کە شێتەو گوێی پێ نادەن.

(٢٦) نوح زۆر بەم قسانە دڵی تەنگبو پەنای بۆ اللّٰه برد و وتی: ئەی پەروەردگارم بە هۆی ئەوەی کە بێباوەڕن پێمو بە درۆم ئەخەنەوە یارمەتیم بدە.

(٢٧) جا نیگامان بۆ ناردو بە وەحی تێمان گەیاند کە ئادەی کەشتیەك لەژێر چاودێری ئێمەو بە گوێرەی وەحی ئێمە دروست بکە، ئەوسا هەر کاتێ بڕیاری ئێمە هات بۆ سزادانی هۆزەکەتو لە تەنوری ئاگرەوە ئاو فوارەی کرد ئیتر بزانە کە ئەوە کاتی

سزایانە، جا ئەو کاتە لە هەمو زیندەوەرێك جوتێكو خاووخێزانو پەیڕەوانت بخەرە ناوییەوە جگە لەو کەسەی لە ناو ئەواندا کە ﷲ زوتر بڕیاری لە ناوچونی داوە، ئەوسا لە بارەی ئەو کەسانەی کە ستەمیان کردوەو باوەڕیان نەهێناوە قسەم لەگەڵدا مەکەو پاکانەیان بۆ مەکە چونکە بێگومان ئەوانە لە ناو ئاودا ئەخنکێنرێن.

(٢٨) جا هەر کاتێ خۆتو ئەوانەی کە لەگەڵتان لەسەر کەشتیەکە وەستان، ئەوسا بڵێ: سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە لە هۆزی ستەمکاران ڕزگاری کردین.

(٢٩) خۆ بیشڵێ : ئەی پەروەردگارم لە شوێنێکی بە پیتو بەفەڕدا دام بەزێنە، جا تۆ چاکترینی هەمومێواندارانی. واتە من مێوانی خۆتمو چاوەڕوانی چاکترینوخۆشترین جێگات لێ دەکەم چونکە تۆ چاکترینی مێوادارانی.

(٣٠) بێگومان لەم داستانەدا چەندین نیشانەی گرنگ بۆ پەندو ئامۆژگاری هەیە، وەچاك بزانە کەئێمە مرۆڤ لەدنیادا تاقی دەکەینەوە تا ڕاستو ناراست لەیەك جیا بکەینەوەو خۆی شایەتبێ لەسەرخۆی، واتە: ئەی مرۆڤ، هاتنی دنیات بۆ تاقی کردنەوەیە تا لەو دنیا بەهانەت نەمێنێ.

(٣١) پاشان گەل وهۆزی ترمان لە پاش ئەوان دروستکرد.

(٣٢) ئەوسا ئێمە لە ناو ئەواندا هەر لە خۆیان پێغەمبەرێکمان بۆ ناردن کە پێی وتن: ﷲ بپە رستن، جگە لەو خوایە کی ترتان نیە کە شایستەی پەرستن بێت، دەی بۆ ئێوە ناترسنو خۆتان لە توڕەیی‌و ڕقو قینی ئەو ناپارێزن؟!

(٣٣) پیاو ماقوڵانی هۆزەکەی ئەوانەی کە کافرو بێباوەڕبون بە ڕۆژی قیامەت، وە لە ژیانی دنیادا نازو نیعمە تێکی بە لێشاومان پێدابون بە گەلەکەی خۆیان وت: ئەمە جگە لەوەی کە مرۆڤێکە وەك ئێوە شتێکی تر نیەو دەخوات لەوەی کە ئێوە دەیخۆنو دەخواتەوە لەوەی کە ئێوە دەیخۆنەوە .

(٣٤) جا ئەگەر ئێوە پەیڕەوی مرۆڤێکی وەك خۆتان بکەن بێگومان بن کە ئیتر ئێوە زیان لێ کەوتوو ڕەنجەڕۆن.

(٣٥) ئایا ئەو بەڵێنتان پێدەدات کە بێگومان هەرکاتێ مردنو بوون بە خۆڵو ئێسقانە پتورکاوو ڕزیو ئێوە تازە زیندو دەکرێنەوەو دەردەهێنرێنەوە؟

(٣٦) هەیهوو چەند دورە، هەیهوو چەند دورە ئەو بەڵێنەی کە بە ئێوە دەدرێت، واتە :باوەڕی پێمەکەن.

مَا تَسۡبِقُ مِنۡ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ (٤٣) ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا تَتۡرَاۖ كُلَّ مَا جَآءَ أُمَّةً رَّسُولُهَا كَذَّبُوهُۖ فَأَتۡبَعۡنَا بَعۡضَهُم بَعۡضًا وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَحَادِيثَۚ فَبُعۡدًا لِّقَوۡمٍ لَّا يُؤۡمِنُونَ (٤٤) ثُمَّ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ وَأَخَاهُ هَٰرُونَ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٍ مُّبِينٍ (٤٥) إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ وَكَانُواْ قَوۡمًا عَالِينَ (٤٦) فَقَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لِبَشَرَيۡنِ مِثۡلِنَا وَقَوۡمُهُمَا لَنَا عَٰبِدُونَ (٤٧) فَكَذَّبُوهُمَا فَكَانُواْ مِنَ ٱلۡمُهۡلَكِينَ (٤٨) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ (٤٩) وَجَعَلۡنَا ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥٓ ءَايَةً وَءَاوَيۡنَٰهُمَآ إِلَىٰ رَبۡوَةٍ ذَاتِ قَرَارٍ وَمَعِينٍ (٥٠) يَٰٓأَيُّهَا ٱلرُّسُلُ كُلُواْ مِنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَٱعۡمَلُواْ صَٰلِحًاۖ إِنِّي بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٌ (٥١) وَإِنَّ هَٰذِهِۦٓ أُمَّتُكُمۡ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَأَنَا۠ رَبُّكُمۡ فَٱتَّقُونِ (٥٢) فَتَقَطَّعُوٓاْ أَمۡرَهُم بَيۡنَهُمۡ زُبُرًاۖ كُلُّ حِزۡبِۭ بِمَا لَدَيۡهِمۡ فَرِحُونَ (٥٣) فَذَرۡهُمۡ فِي غَمۡرَتِهِمۡ حَتَّىٰ حِينٍ (٥٤) أَيَحۡسَبُونَ أَنَّمَا نُمِدُّهُم بِهِۦ مِن مَّالٖ وَبَنِينَ (٥٥) نُسَارِعُ لَهُمۡ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ بَل لَّا يَشۡعُرُونَ (٥٦) إِنَّ ٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ خَشۡيَةِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ (٥٧) وَٱلَّذِينَ هُم بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ يُؤۡمِنُونَ (٥٨) وَٱلَّذِينَ هُم بِرَبِّهِمۡ لَا يُشۡرِكُونَ (٥٩)

(٣٧) ژیانێکی تر نیە جگە لەم ژیانەی دنیامان کە دەمرینو دەژین. خۆ ئێمە زیندو ناکرێینەوە، جا بە قسەی ئەو پێغەمبەرە باوەڕ مەکەن،

(٣٨) چونکە ئەو جگە لەوەی کە پیاوێکەو درۆ بەدەم خواوە دەکات هیچی تری لا نیە، جا ئێمەیش باوەڕی پێناکەین. ئا بەو شێوەیە دنیا پەرستانو خۆ بەزلزانان دژی پێغەمبەرەکەیان ڕەفتاریان کردەوە، جا ئەمە نەریتو باوی هەمو سەردەمەکان بوەو هەتا ئەو ڕۆژەی کە ﷲ ئەم جیهانە تێك دەداتو هەروایش دەبێت.

(٣٩) پێغەمبەرەکەیان وتی: ئەی پەروەردگارم بە هۆی ئەوەوە کە بە درۆم دەخەنەوە خۆت فریام کەوەو یارمەتیم بدە.

(٤٠) (ﷲ)یش فەرموی: لە ماوەیەکی زۆر کەمدا دڵنیابە کە پەشیمان دەبنەوە. زۆر ناخایەنێ کە تۆڵەیان لێدەسێنین، جا لەوکاتەدا دەزانن کە تۆ ڕاست بویت، ئینجا پەشیمان دەبنەوە کە پەشیمانی ئەوکاتەش هیچ سودیان پێنادات.

(٤١) جا یەك نەعرەتەو دەنگی بە گوڕ لێیدان ئەوسا وەك (**ئاوماڵك**) مان لێکردن جا سیسو مردو بەسەر یەکدا چەنومل کەوتن، ئینجا بێژرا هەر ئاوا دوریو بێ‌نرخی هەر بۆ گەلی ستەمکاران.

(٤٢) پاش لەناوبردنی ئەوان چەندین تیرەو بەرەی ترمان پێك هێنا.

(٤٣)هیچ گەلێك ناتوانێ كە ماوەی خۆی پاش‌و پێش بخات بەڵكو هەر یەكە لە كاتی دیاری خۆیدا ماوەی ژیانی دوایی دێت‌و دەبێ بەرەو مردن‌و پاشان زیندوكردنەوەو حیسابو كیتاب بڕۆن چاكبن یان خراپ، دەسەڵاتداربن یان بێدەسەڵات دەوڵەمەند بن یان هەژار.

(٤٤) پاشان فرستادەو پێغەمبەرانی خۆمانمان یەك لە دوای یەك بۆ ئەو گەلانە رەوانە كردوە هەر وەختێك پێغەمبەری ئەو گەلە چووەتە ناویان‌و باسی بۆ كردبن بە درۆیان خستوەتەوەو باوەڕیان پێنەكردوە، جا یەك بە دوای یەكدا بە دەردێكی وامان لە ناوبردون كە كردومانن بە پەندو داستان بۆ پاش خۆیان جا دوری لە بەزەیی‌و رەحمی ﷲ بۆ گەلێكە كە باوەڕ ناهێنن.

(٤٥) پاشان موسی‌و هارونی برایمان(سەلامی خوایان لێبێ) بە نیشانەكانی خۆمان‌و بە بەڵگەو هێزێكی رۆشنكەرەوە ناردن.

(٤٦)بۆلای فیرعەون‌و پیاوانی دەربارەی بۆئەوەی كە واز لە بێباوەڕی بهێنن، جا ئەوان خۆیان بەزل گرت‌و باوەڕیان پێ نەكردن‌و بەراستی گەلێكی خۆ پەسەندو بەدەمار بون.

(٤٧)ئەوسا وتیان: ئایا باوەڕ بهێنین بە دوو مرۆڤی وەك خۆمان لە حاڵێكدا كە هۆزەكەیشیان بەندەی ئێمەن؟

(٤٨)جا هەردووكیان بەدرۆ خستنەوەو باوەڕیان پێنەكردن، ئەوسا ئەوانیش چونە ریزی لەناوچوانەوەو لە دەریای نیلدا خنكێنران‌و خۆ پەسەندی‌و لوت بەرزیان فریایان نەكەوت.

(٤٩)ئەوسا بەراستی ئێمە (**تەورات**)مان دا بە موسا بەڵكو ئەوان رێگای راست بگرن‌و دەست لە كوفرو ستەم‌و لوت بەرزی بكێشنەوە كەچی دژایەتیان كرد.

(٥٠)ئینجا ﷲ باسی عیساو دایكی دەكات‌و دەفەرموێ: جا عیسای كوڕی مەریەم و دایكی ئەومان كرد بە نیشانەیەكی گەورە لە سەر دەسەڵات‌و هێزی ﷲ، جا ئەوانمان لە سەر تەپۆڵكەیەك كە دڵگیربو بە سەوزاییەكەی‌و خاوەنی كانی ئاو بو جێگیر كرد تا لەوێدا بحەسێنەوە، ئینجا ﷲ بانگی پێغەمبەران دەكات‌و دەفەرموێ:

(٥١)ئەی پێغەمبەران لە شتە پاكەكان بخۆن‌و ئیشی چاك بكەن، چاك بزانن كە من زانام بە هەرشتێك كە ئێوە دەیكەن، ﷲ لە هەمو سەردەمێكدا كە پێغەمبەرێكی ناردوە ئەم فەرمانەی پێكردوە تا خەڵكی بە گرنگی بزانن‌و لە شتی پاك نەبێ نەخۆن. پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { **أيها الناسُ إن اللهَ طيبٌ لا يَقْبلُ إلاّ طيِّبًا وَإن اللهَ أمَرَ المُؤمِنِينَ بِمَا أمَرَ بِهِ المُرْسَلِينَ فَقالَ يَا أيها الرسُلُ كُلُوا مِنْ الطيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إنِي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ وَقالَ يَا أيها الذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ ثُم ذَكَرَ الرجُلَ يُطِيلُ السفَرَ أشْعَثَ أغْبَرَ يَمُد يَدَيْهِ إلى السمَاءِ يَا رَب يَا رَب وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ وَغُذِيَ بِالحَرَامِ فَأنى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ**/مسلم / ئەی خەڵكینە بێگومان كە ﷲ پاكەو جگە لە پاكیش وەرناگرێت، بێگومان كە ﷲ ئەو فەرمانەی كە بە پێغەمبەرانی كردوە هەر ئەو فەرمانەیشی بە باوڕداران كردوە، پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەو ئایەتی سورەتی (بەقەرە)ی خویندەوە كە كە فەرمان دە دات بە باوەردان كە لە پاك‌و خاوێنەكان بخۆن پاشان باسی پیاوێكی كرد كەسەفەری درێژماوە دەكات لە بەندایەتیداو موی سەری ئاڵۆزاوو تەپ‌و تۆزاوییەو دەستی بەرزدەكاتەوە بۆ ئاسمان‌و هاوار ئەكات ئەی پەروەردگارم... ئەی پەروەدگارم... لە كاتێكدا خواردنی حەرامەو خواردنەوەی حەرامەو پۆشاكی حەرامەو بە حەرامیش گۆشبوە جا چۆن ئەو هاوارو پاڕانەوەی لێ وەردەگیرێت؟}

(٥٢)ئەوسا بێگومان ئەم ئاینەی ئێوە یەك ئایینە، جا بە چاكی دەستی پێوە بگرن‌و پەیڕەوی لێ بكەن‌و پەرتەوازە مەبن، خۆ من پەروەردگاری ئێوەم، جا ئێوەش خۆتان لە توڕەیی‌و رقی من بپارێزن‌و یەك دەست‌و یەك پارچە بن‌و پشتی یەكتر بگرن، ئینجا خۆی تێمان دەگەیەنێ كە مرۆڤ بە زۆری سپڵەو نمەك نەشناسەو لە باتی پەیڕەوی ﷲ پەیڕەوی نەفس‌و شەیتان دەكات.

(٥٣) كەچی ئەوان لە نێوان خۆیاندا كاری خۆیانیان بچڕبچڕ كرد چ بچڕبچڕ كردنیش جا بون بە دەستە دەستەوهەر دەستەو پارچەیەكیش خۆی هەڵدەكێشێ بەوەی كە لەلایەتی‌و بەشەكەی تری بە لاوە لارێ‌و هەڵەیە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {**ألا إن مَنْ قَبْلكُمْ مِنْ أهْلِ الكِتَابِ افْتَرَقُوا عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلةً وَإن هَذِهِ المِلةَ سَتَفْتَرِقُ عَلَى ثَلاثٍ وَسَبْعِينَ ثِنْتَانِ وَسَبْعُونَ فِي النارِ وَوَاحِدَةٌ فِي الجَنةِ وَهِيَ الجَمَاعَةُ** /واتە: ئەوانەی پێش ئێوە كە خاوەن پەڕاو بون، بوون بە حەفتاو دوو بەشەوە، جا بێگومان ئەم گەلەیش دەبێت بە حەفتاو سێ بەشەوە، حەفتاو دوو بەشی لە ناو ئاگردان یەك بەشیان بەهەشتیە كە هەر ئەویشە جەماعە) جا ﷲ بە هۆی ئەو پەرتەوازەیەوە كە كردیان، هەڕەشەیان لێ دەكات‌و دەفەرموێ:

(٥٤) تۆ وازیان لێ بهێنە تا ماوەیە بۆ ئەوەی لە زەلکاوی کوفرو نەزانی خۆیاندا زیاتر بچنە خوارەوەو باری تاوانیان قورستر ببێت.

(٥٥) ئایا وا ئەزانن کەئێمە یارمەتیان دەدەین بەماڵو کوڕانی زۆر لەبەر ئەوەیە کە،

(٥٦) ئێمە بەپەلەین لە چاکە لەگەل کردنیان دا؟ نەخێر بەڵکو ئەوان هەستی چاکو خراپ ناکەن.

(٥٧) بە راستی ئەوکەسانەی کە لە ترسی پەروەردگاری خۆیان لە گەڵ خۆشەویستیدا بۆی لێی دەترسنولەبەرسامووهەیبەتی ئەو دەلەرزن.

(٥٨) جا ئەو کەسانەیش کە بە نیشانە کانی پەروەردگاریان باوەڕ ئەهێنن.

(٥٩) وە ئەو کەسانەیش کە هیچ کەس ناکەن بە هاو بەشی پەروەردگاریانو هەر خۆی دەپەرستن.

(٦٠) خۆ ئەو کەسانەیش کە لە رەفتارو وتاری چاك دەیکەن ئەوەی کە دەیکەن بۆ ﷲ لە گەل ئەوەیشدا دڵیان هەر دەترسێت، چونکە دڵنیان کە سەر ئەنجام دەگەڕێنەوە بۆلای ئەو کەسەی کە ئاگای لە هەمو نیەتو قسەو کردارەو ئەترسن لێیان وەرنەگیرێت.

(٦١) ئەوانە لە ئەنجامدانی کردارو رەفتارە چاکەکاندا پەلە ئەکەن، وە ئەوان بۆ ئەنجامدانی ئیشە چاکەکان زۆر لەپێشن.

(٦٢) خۆ ئەرك نادەین بە سەر هیچ کەسێکدا مەگەر بە ئەندازەی توانای خۆی، ئەوسا پەڕاوێکمان لایە کە تەنها راست دەڵێتو لەسەر کەس زیادو کەم ناکاتو ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت.

(٦٣) بەڵکو بێباوەڕان دڵەکانیان بێئاگایە لەم پەڕاوە راست وێژەو ئەوان ئیشو کار گەلێکی وایان هەیە دورە لە راستییەوەو دەڵێیت ئەوان هەر بۆ ئەوە دروست کراون.

(٦٤) تا ئەو کاتەی کە خۆشگوزەرانەکانیان دوچاری سزا دەکەین کتو پڕ ئەوان دەست بە هاوارو کڕوزانەوە ئەکەن و بەرگەی بچوکترین سزا ناگرن.

(٦٥) ئەمڕۆ مەکڕوزێنەوەو هاوار مەکەن، چونکە بێگومان ئێوە لە لایەن ئێمەوە یارمەتی نادرێن کەواتە هاتو هاوارتان بێکەڵکە.

وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ﴿٦٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَهُمۡ لَهَا سَٰبِقُونَ ﴿٦١﴾ وَلَا نُكَلِّفُ نَفۡسًا إِلَّا وُسۡعَهَاۖ وَلَدَيۡنَا كِتَٰبٞ يَنطِقُ بِٱلۡحَقِّۚ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٢﴾ بَلۡ قُلُوبُهُمۡ فِي غَمۡرَةٖ مِّنۡ هَٰذَا وَلَهُمۡ أَعۡمَٰلٞ مِّن دُونِ ذَٰلِكَ هُمۡ لَهَا عَٰمِلُونَ ﴿٦٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَخَذۡنَا مُتۡرَفِيهِم بِٱلۡعَذَابِ إِذَا هُمۡ يَجۡـَٔرُونَ ﴿٦٤﴾ لَا تَجۡـَٔرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّكُم مِّنَّا لَا تُنصَرُونَ ﴿٦٥﴾ قَدۡ كَانَتۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ تَنكِصُونَ ﴿٦٦﴾ مُسۡتَكۡبِرِينَ بِهِۦ سَٰمِرٗا تَهۡجُرُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَلَمۡ يَدَّبَّرُواْ ٱلۡقَوۡلَ أَمۡ جَآءَهُم مَّا لَمۡ يَأۡتِ ءَابَآءَهُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ أَمۡ لَمۡ يَعۡرِفُواْ رَسُولَهُمۡ فَهُمۡ لَهُۥ مُنكِرُونَ ﴿٦٩﴾ أَمۡ يَقُولُونَ بِهِۦ جِنَّةُۢۚ بَلۡ جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَوِ ٱتَّبَعَ ٱلۡحَقُّ أَهۡوَآءَهُمۡ لَفَسَدَتِ ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ وَمَن فِيهِنَّۚ بَلۡ أَتَيۡنَٰهُم بِذِكۡرِهِمۡ فَهُمۡ عَن ذِكۡرِهِم مُّعۡرِضُونَ ﴿٧١﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ خَرۡجٗا فَخَرَاجُ رَبِّكَ خَيۡرٞۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّكَ لَتَدۡعُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ عَنِ ٱلصِّرَٰطِ لَنَٰكِبُونَ ﴿٧٤﴾

(٦٦) بەراستی نیشانەکانی من بەسەر ئێوەدا خوێنرایەوە، جا ئێوە پشتاو پشت گەڕانەوە.

(٦٧) بە هۆی بونتان لەدەوروبەری ماڵی(ﷲ)دا لەجیاتی بەندایەتی بۆ کردنی، بەو ماڵە خۆتان هەڵدەکێشنو شەوان کۆڕ دەگرنو گاڵتە بەپێغەمبەرو بە قورئان دەکەن.

(٦٨) ئایا بیریان لەم قسە بەنرخە نەکردەوەتەوە کە باوەڕی پێ بهێنن ؟ یان هاتوتە لای ئەوان ئەوەی کە نەهاتوەتە لای باو باپیرە پێشوەکانیان؟

(٦٩) یان ئایا پێغەمبەرەکەی خۆیان بە راستگۆو ئەمین نەناسیوە وائیستا ئاوا حاشای لێدەکەن؟

(٧٠) یان ئایا دەڵێن: ئەو پێغەمبەرە شێتە؟ نەخێر وانیە کە ئەوان دەڵێن بەڵکو بەراستی هاتوەتە لایانو بۆ راستی بانگیان دەکات؟ بەڵام زۆربەی ئەوان راستییان پێناخۆشەو بە دوای هەڵەدا بازبازانیانە.

(٧١) ئەگەر حەقو راستی بە گوێرەی ئارەزۆی ئەوان بوایە بە راستی ئاسمانانو زەویو ئەوەی کە لە ناویاندایە خراپ ئەبو. وەك ئەمڕۆ کە بە چاوی خۆمان دەیبینین کەراست لەلایان لارەو لاریان لاراستە؟! چاکەو رەوشت بەرزی عەیبەو شوڕەیی و رەوشت نزمی جێگای شانازیە؟ ئەزانی بۆ؟ چونکە لە یاسای ﷲ لادراوە

۞ وَلَوْ رَحِمْنَاهُمْ وَكَشَفْنَا مَا بِهِم مِّن ضُرٍّ لَّلَجُّوا فِي طُغْيَانِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٥﴾ وَلَقَدْ أَخَذْنَاهُم بِالْعَذَابِ فَمَا اسْتَكَانُوا لِرَبِّهِمْ وَمَا يَتَضَرَّعُونَ ﴿٧٦﴾ حَتَّىٰ إِذَا فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا ذَا عَذَابٍ شَدِيدٍ إِذَا هُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٧﴾ وَهُوَ الَّذِي أَنشَأَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ ۚ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ وَهُوَ الَّذِي ذَرَأَكُمْ فِي الْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٧٩﴾ وَهُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ وَلَهُ اخْتِلَافُ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٨٠﴾ بَلْ قَالُوا مِثْلَ مَا قَالَ الْأَوَّلُونَ ﴿٨١﴾ قَالُوا أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٨٢﴾ لَقَدْ وُعِدْنَا نَحْنُ وَآبَاؤُنَا هَٰذَا مِن قَبْلُ إِنْ هَٰذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ ﴿٨٣﴾ قُل لِّمَنِ الْأَرْضُ وَمَن فِيهَا إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٤﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٨٥﴾ قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾ قُلْ مَن بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيْهِ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٨٨﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ ۚ قُلْ فَأَنَّىٰ تُسْحَرُونَ ﴿٨٩﴾

وپەیرەوی ئارەزۆ دەكرێت، جا هەر كاتت زانی رۆژی رەش یەخەی گرتین، جا ﷲ ئەفەرموێ: بەڵكو ئێمە ئامۆژگاریو مایەی شەرفو ڕێزمان بۆناردن كەچی ئەوان لە ئامۆژگاریو مایەی شەرەفی خۆیان كە ئەم قورئانە بەرێزەیە پشت هەڵدەكەن؟! بەڵێ، شەمشەمەكوێرە دژی رۆژە!!

﴿٧٢﴾ئایا تۆ داوای كرێیان لێ ئەكەیت لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە بەوان تا لە تۆ بتەكێنەوە؟ نەخێر تۆ هیچت لەوان ناوێ، تۆ پاداشت وكرێی خۆتت لە ﷲ دەوێ، چونكە هەر پاداشت وكرێی پەروەردگارت چاكەو خێرە خۆ هەر ئەو زاتە خۆی چاكترینی رۆزی دەرانە.

﴿٧٣﴾ جا بەراستی تۆ ئەوان بۆ ڕێگای راست بانگ دەكەیتو دەتەوێ كە بیان خەیتە سەر ئەو رێگایە كە مایەی خۆشبەختی هەردوو ژیانیانە كەچی ئەوان دژایەتیت دەكەن.

﴿٧٤﴾ بێگومان ئەوانەی كە باوەڕناكەن بە پاشەرۆژ لەو رێگە راستە لادەدەن.

﴿٧٥﴾خۆئەگەر بەزەیمان بەواندا بهاتایەوەو ئەو گرفتاریو تەنگو چڵەمەیەمان لەسەر لابېردنایە زیاتر كوێرانە لەو سەركەشیو زیادەڕەویدا دەمانەوە. بەڵێ بەراستی ئەوان دوو دڵ تر دەبونو دەیان وت: سروشتیەو خۆشیو ناخۆشی لەدنیادا هەربووە نایدەنە پاڵ بەزەییو سۆزی ﷲ .

﴿٧٦﴾جا بەراستی ئێمە چەندین جار دوچاری سزامان كردن بۆ ئەوەی بە خۆدا بچنەوەو بیر لە ئایندەی خۆیان بكەنەوە، كەچی ئەوان نە خۆیان دایە دەست پەروەردگاری خۆیانەوەو نە لێیشی دەپاڕێنەوە، چونكە باوەڕیان بەوە نیە كە خوایە ئەم خۆشیو ناخۆشیە دەهێنێ، هەروەك ئەمڕۆ دەبینین كە بومەلەرزە یان لافاو دەدات لە وڵاتێكو بە هەزاران كەس بە چاوتروكاندنێك لەناو دەچێتو هەزاران خانو وێران دەبێو بە مەلایین زیان لە وڵاتێك دەكەوێت، جا لە جیاتی ئەوەی كە پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرنو بە تاوانەكانی خۆیاندا بچنەوە، دەڵێن: رووداوێكی سروشتیەو هیچی تر!

﴿٧٧﴾جا هەر بەوشێوەیە دەبن تا ئەو كاتەی كە دەرگای سزای بە هێزو توندیان لەسەر دەكەینەوە، كتوپڕ لە ناو ئەو سزایەدا نائومێد دەبن. جا ئا لەوكاتەدا پەشیمان دەبنەوەو قەپ بەدەستی خۆیاندا دەكەن بەڵام بێسودە.

﴿٧٨﴾خۆ ئەو زاتە خۆیەتی كە كەرەسەی بیستنو بینینو بیركردنەوەی پێداون تا راستی پێ‌ببیننو ورد ببنەوەو ئەوەی بە سودە وەریگرن ولەوەی خراپە دور بكەنەوە بەڵام كەمێكتان شوكرو سوپاسی ﷲ دەكەن، بێگومان ئەوانەی كە سوپاسگوزارن كەمنو بەكەمی منەت لەخوا دەزانن.

﴿٧٩﴾جا هەر خۆیەتی كە ئێوەی لەو زەوییەی بەدیهێناوە، وە هەر بۆلای ئەویش كۆ دەكرێنەوە.

﴿٨٠﴾جا هەر خۆیشێتی كە زیندو دەكاتەوەو دەمرێنێ، كەسی تر ئەوەی بەدەست نیە، وە هەر بەفەرمانی ئەوە گۆڕاندنی شەوو رۆژ، دەی ئایا ئێوە عەقڵو هۆشی خۆتان ناخەنە كارەوە تاراستوناڕاست لەیەك جیابكەنەوە ؟ سا تا كەی لەو هەمو ئاڵوگۆڕو نیعمەتو زەحمەتانە تێ ناگەن ؟

﴿٨١﴾بەڵكو وتیان: هەر وەك ئەوەی كە پێشوەكان وتیان.

﴿٨٢﴾وتیان: ئایا كاتێ كە ئێمە مردین وبوین بەخاك وبەئێسقانی پتوركاو ئایا تازە زیندو دەكرێینەوە؟ نەخێر شتیوا دورەو نەگونجاوە!

﴿٨٣﴾بەحەقیقەت ئێمەو باو باپیرانمان لەپێشدا ئەم بەڵێنەمان پێدرابو ئەوان باوەڕیان پێ نەكردو ئێمەیش باوەڕی پێ‌ناكەینو ئەڵێین ئەمە جگە لە داستانە خەیاڵییەكانی پێشوان شتێكی‌تر نیە.

﴿٨٤﴾ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەگەر ئێوە شتێك دەزانن دەی زەویو ئەوەی كە لەناویدایە مۆڵكی كێیە؟

(٨٥) زۆربە زوویی دەڵێن: موڵکی (اللە)یە بڵێ: دەی ئیتر هەر بیر ناکەنەوە، تاکەی خۆتان گێڵو گەمژە دەکەن، جا ژیربن وبیر بکەنەوەو هەنگاوی کوێرانە مەنێن مادامێك خۆتان دان بە خاوەنیەتی (اللە)دا دەنێن دەی ژیر بنو هەر بەندایەتی بۆ ئەو بکەن.

(٨٦) بڵێ: کێیە پەروەردگاری هەر حەوت ئاسمانەکانو پەروەردگاری عەرشی گەورە؟

(٨٧) هەر زوو دەڵێن: موڵکی (اللە)یەو ئەو پەروەردگارو بەدیهێنەریانە، بڵێ: دەی بۆ هیچ ترسێکتان لەو نیە؟ ئەمە چۆن عەقڵێکە کە ئا لەو زاتە گەورەو بەهێزە ناترسن؟

(٨٨) ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەگەر ئێوە دەزانن دەسەڵاتی هەمو شتێك بەدەست کێیە لە حاڵێکدا کە هەرخۆی پەنا دەداتو پەنای لێ نادرێت؟

(٨٩) بەم زوانە دەڵێن: موڵکی (اللە)یە، بڵێ: دەی چۆن وا فریو دراوو سیحر لێ کراون، کە حەقو راستیتان لێ بووە بەقسەی پڕو پوچو درۆ ؟

(٩٠) ئاوەها نیە کە دەیڵێن بەڵکو ئێمە راستیمان پێدان بەڵام ئەوان شوێنی قسەی پڕوپوچو درۆ کەوتن، بێگومان بۆخۆیان درۆزنن.

(٩١) اللە منداڵی بۆ خۆی دانەناوە، ئەوسا هیچ پەرستراوێکی تری لەگەل دا نیە و تاکو تەنیایە ئەگەر خودای تری لەگەڵدا بوایە بێگومان هەر خوایەك دروستکراوی خۆی دەبردو کێشەو ناکۆکی لە نێوانیاندا روی دەداو کاروباری بونەوەر تێكوپێك دەچو، جا ئەو کاتە هەندێك لە خواکان زاڵ دەبون بەسەر هەندێك دا، اللە پاکەو بێگەردەو دوورە لەو وەسفەی کە ئەو موشریکانە دەیکەن.

(٩٢) خوا ئاگایە بە هەرچی پەنامەکیو ئاشکرایە، جا ئەو بەرزترو بەشکۆترە لەوەی کە ئەوان دەیکەن بەشەریکی.

(٩٣) بڵێ: ئەی پەروەردگارم ئەگەر ئەو هەڕەشەیەی کە لەوان دەکرێت پیشانی منی دەدەیتو لەسەردەمی مندا دەبێت،

(٩٤) دەسا ئەی پەروەردگارم من لەناو ئەو ستەمکارانەدا دامەنێو وەکو ئەوان دوچاری ئەو سزایەم مەکە، جا بە پەیڕەوی لەم ئایەتە پێغەمبەرمان ﷺ دوعای دەکردو دەیفەرمو: {وَإِذَا أَرَدْتَ بِعِبَادِكَ فِتْنَةً فَاقْبِضْنِي إِلَيْكَ غَيْرَ مَفْتُونٍ /ا د، صححه الألبا / هەر

بَلْ أَتَيْنَٰهُم بِٱلْحَقِّ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ (٩٠) مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ ۚ إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍۭ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ (٩١) عَٰلِمِ ٱلْغَيْبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ فَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ (٩٢) قُل رَّبِّ إِمَّا تُرِيَنِّى مَا يُوعَدُونَ (٩٣) رَبِّ فَلَا تَجْعَلْنِى فِى ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ (٩٤) وَإِنَّا عَلَىٰٓ أَن نُّرِيَكَ مَا نَعِدُهُمْ لَقَٰدِرُونَ (٩٥) ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ٱلسَّيِّئَةَ ۚ نَحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَصِفُونَ (٩٦) وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَٰتِ ٱلشَّيَٰطِينِ (٩٧) وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ (٩٨) حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ٱرْجِعُونِ (٩٩) لَعَلِّىٓ أَعْمَلُ صَٰلِحًا فِيمَا تَرَكْتُ ۚ كَلَّآ ۚ إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَآئِلُهَا ۖ وَمِن وَرَآئِهِم بَرْزَخٌ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ (١٠٠) فَإِذَا نُفِخَ فِى ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ (١٠١) فَمَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ (١٠٢) وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ (١٠٣) تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ ٱلنَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَٰلِحُونَ (١٠٤)

کاتێ ویستت بەندەکانت دوچاری بەڵایەك بکەیت جا پێش ئەوە من ببەرەوە بۆلای خۆت بێ ئەوەی دوچاری ئەوبەڵایە ببم }

(٩٥) جا بێگومان ئێمە هەرچی بۆ ئەوان بڕیار بدەینو هەرچییان بەسەر بهێنین دەتوانین نیشانی تۆیشی بدەین، ئینجا (اللە) بۆ چاکتر گونجان لەناو خەڵكو لەناو کۆمەڵگادا ڕێنمای پێغەمبەرمانﷺدەکات بۆ ئیشێکی گرنگو دەفەرموێ:

(٩٦) خراپەی خەڵك بە ڕەفتارو کرداری جوان، لە خۆت دور بخەرەوە، وا مەزانە کە ئێمە بێ ئاگایین لێیان، بۆیە ئاوا داوایەکت لێ دەکەین بەڵکو ئێمە چاکتر دەزانین بەو وەسفە ناشیرینانەی کە بە ئێمەی دەڵێن، جا وەڵامدانەوەی کردارە ناشیرینو خراپەکانی دوژمنانت بەچاکە، دەبێ بە هۆی خۆشەویستی خەڵك بۆتودۆستانت بۆ زیاد دەکاتو دوژمنانت لێ کەم دەکاتەوە، جا هەر کەسێك ئەم وەسفەی هەبێ خاوەنی بەشێکی گەورەیە، وە ئێمەش پەلەیان لێ ناکەینو تا ماوەی دیاری خۆیان نازو نیعمەتی خۆمانیان بەسەردا دەڕژێنینو زۆر نابات دێنەوە بەردەستمانو تۆڵەی خۆیان وەردەگرن. بەڵام خراپەو شەڕی شەیاتینی جنۆکە شتێك نیە کە مرۆڤ بە چاکە کردن لەگەڵیاندا سودی لێوەر بگرێت، چونکە خاوەنی شەڕو هەرگیز چاکەیان لێ ناوەشێتەوەو هەمیشە بۆ تۆڵەی خۆیان هەر خەریکی تێکدانی مرۆڤن جا بۆ ڕەفتار لەگەڵ ئەم بەشەدا

أَلَمۡ تَكُنۡ ءَايَٰتِي تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُواْ رَبَّنَا غَلَبَتۡ عَلَيۡنَا شِقۡوَتُنَا وَكُنَّا قَوۡمٗا ضَآلِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡهَا فَإِنۡ عُدۡنَا فَإِنَّا ظَٰلِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ ٱخۡسَـُٔواْ فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فَرِيقٞ مِّنۡ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّخَذۡتُمُوهُمۡ سِخۡرِيًّا حَتَّىٰٓ أَنسَوۡكُمۡ ذِكۡرِي وَكُنتُم مِّنۡهُمۡ تَضۡحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيۡتُهُمُ ٱلۡيَوۡمَ بِمَا صَبَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿١١١﴾ قَٰلَ كَمۡ لَبِثۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ عَدَدَ سِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُواْ لَبِثۡنَا يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖ فَسۡـَٔلِ ٱلۡعَآدِّينَ ﴿١١٣﴾ قَٰلَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗاۖ لَّوۡ أَنَّكُمۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١١٤﴾ أَفَحَسِبۡتُمۡ أَنَّمَا خَلَقۡنَٰكُمۡ عَبَثٗا وَأَنَّكُمۡ إِلَيۡنَا لَا تُرۡجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡحَقُّۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡكَرِيمِ ﴿١١٦﴾ وَمَن يَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرۡهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓۚ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ وَقُل رَّبِّ ٱغۡفِرۡ وَٱرۡحَمۡ وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰحِمِينَ ﴿١١٨﴾

٢٤ سُورَةُ النُّورِ ٦٤

پەروەردگارمان بەم شێوە یە ئامۆژگاری پێغەمبەرمانﷺدەکات‌و دەفەرموێ: بلێ:

﴿٩٧﴾ ئەی پەروەردگارم هانات بۆ دەهێنم لە وەسوەسەو دنەدانی شەیتانەکان.

﴿٩٨﴾ دەسا ئەی پەروەردگارم پەنات پێ‌دەگرم‌و هانات بۆدێنم کە ئەوانە لێم نزیك ببنەوەو دەست بخەنە ناو کاروبارم، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: {إن الشيْطَانَ يَحْضُرُ أَحَدَكُمْ عِنْدَ كُل شَيْءٍ مِنْ شَأْنِهِ حَتى يَحْضُرَهُ عِنْدَ طَعَامِهِ فَإِذَا سَقَطَتْ مِنْ أَحَدِكُمْ اللقْمَةُ فَلْيمِطْ مَا كَانَ بِهَا مِنْ أَذًى ثُم لِيأكُلْهَا وَلَا يَدَعْهَا لِلشيْطَانِ فَإِذَا فَرَغَ فَلْيلْعَقْ أَصَابِعَهُ فَإِنهُ لَا يَدْرِي فِي أي طَعَامِهِ تَكُونُ الْبَرَكَةُ / مسلم وغ ه / بێگومان کە شەیتان لە هەمو کاروباری هەر یەك لە ئێوە دا ئامادە دەبێت تەنانەت ئامادەی کاتی خواردنیشی دەبێت، جا هەر کاتێك پاروی یەکێکتان کەوت با ئەو شتە بێزراوەی کە بەو پاروە دەدرێت لای بات‌و پاشان با ئەو پاروە بخوات‌و وازی لێ نەهێنێت بۆ شەیتان، وە هەر کاتێك لێ بویەوە با پەنجەکانی بلێسێتەوە، چونکە نازانێت لە کوێی خواردنەکەی دا خەیرو بەرەکەت هەیە}.

﴿٩٩﴾ خراپەکاران هەروا سەرگەرمی خراپەو بێدینین تا ئەو کاتەی کە مەرگ یەخەیان دەگرێت ئەوسا دەڵێ: ئەی پەروەردگارم بمگەڕێنەوە بۆ دنیاو جارێ مەمکوژە.

﴿١٠٠﴾ بەڵکو ئەو ئیشە چاکانە بکەم کە وازم لێ هێنا بوون، چونکە ئەو کاتە نەفام‌و نەزان بووم‌و ئێستا چاك تێگەیشتوم، نەخێر شتی وانیەو جارێکی‌تر ناگەڕێیتەوەو ئەوە هەر قسەیەکەو بەدەمیادێت، ئەگەر ماوەی گەڕانەوەیشی پێ بدرێ هەر قسەیەو هەرگیز ئیشی باش ناکات بەڵکو زیاتر لەخۆبایی دەبێ‌و دەڵێت: قیامەت چییە؟ کەمردم دیسان داوا دەکەم بمهێننەوە، واتە: قیامەت لەلای دەبێ بە گاڵتەو گەمە بەڵام ﷲ شتی ئاوەها ناکات و پەردەیەکی بتەوو بەهێزیان لە بەردەمدایەو ناگەڕێنەوە بۆ دنیا هەتا رۆژی زیندوکردنەوە.

﴿١٠١﴾ خۆ کاتێ کە فوکرا بە کەڵەشاخداو زیندوکرانەوە روداوەکە ئەوەندە سەختو دژوارە ئەوسا ئەو کاتە نە خزمایەتی دەمێنی‌و نە پرسیار لەیەکتر دەکەن.

﴿١٠٢﴾ جا ئەو کەسەی کە کێشراوی چاکەکانی قورس بێت ئەوسا ئەوانە دیارە رزگارو خۆشبەختن.

﴿١٠٣﴾ خۆ ئەو کەسەیش کە کێشراوی چاکەکانی سوك بێ‌و خراپەی زۆربیت، جا ئەوانە ئەو کەسانەن کە خۆیانیان دۆڕاندوەو زیان لێ‌کەوتو شەرمەندەو سەرشۆڕن‌و بۆ هەمیشەیش لە دۆزەخدان .

﴿١٠٤﴾ ئاگر دەم‌و چاویان دا دەپلۆسێنێت، جا ئەوان لەناو ئەو ئاگرەدا دەم‌ولێو هەڵقرچاوو ناشیرینن، سەرەرای ئەوەش لۆمەو سەرزەنشت دەکرێن‌و ﷲ پێیان دەفەرموێ:

﴿١٠٥﴾ ئایا نیشانەکانمان نەهاتە لاتان کە بەسەرتاندا بخوێنرێتەوە، جابە درۆتان دەخستنەوەو باوەڕتان پێ نەدەهێنا؟

﴿١٠٦﴾ وتیان بەڵێ: وایە، ئەی پەروەردگارمان، نەگبەتی روی تێکردین‌و بەدبەختی زاڵبو بەسەرماندا، وە ئێمە گەلێکی لاڕێ‌و سەر لێ شیواو بوین.

﴿١٠٧﴾ ئەی پەروەردگارمان لەم سزایە دەرمان بکەو بمانگەڕێنەوە بۆ دنیا ئینجا ئەگەر ئێمە جارێکی تر گەڕاینەوە بۆ ئەو ئیشە خراپانەی پێشو، ئەوسا بێگومان ئێمە ستەمکارین.

﴿١٠٨﴾ ﷲ دەفەرموێ: دە برۆن دورکەونەوەو دەنگتان دەرنەیەت‌و هیچ قسەم لەگەڵدا مەکەن. جا ئابەم شێوەیە ﷲ دەمکوتی ئەو تاوانبارانە دەکات‌و لە گەڕانەوە بۆ دنیاو لاچونی سزا لەسەریان نائومێدیان دەکات. ئینجا هەندێ لەوکارە ناپەسەندانەیان دەداتەوە بەروویانداو دەفەرموێ:

﴿١٠٩﴾ بێگومان تاقمێك لە بەندە راستەقینەکانم بون کە یادی منیان دەکردو دەیان وت: ئەی پەروەردگارم باوەڕمان هێناوە،

دەسا تۆیش لێمان خۆشبەو رەحممان پێبکە، وە تۆ لە هەمو خاوەن بەزەییەکان بە بەزەی وبەرەحمتری.

(١١٠) خۆ ئێوە ئەوانتان بە نەزانو ساویلکە دادەناو گاڵتەتان پێدەکردنو ئەوەندە بەو گەمەو گاڵتەوە خۆتان سەرگەرم کردبو تا یادی منیان لەبیرتان بردەوە، لەحاڵێکدا کە ئێوە بەوان پێدەکەنین، جا ئەمرۆ تەماشای بارو دۆخی خۆتان بکەنو چاویش لە خۆشیو ژیانی ئەوان بکەن،

(١١١) بێگومان منیش بە هۆی خۆ گرتنیان لەسەر بەندایەتیو ئێشو ئازارێ کە ئێوە بۆتان دروستکرد بون ئەمرۆ پاداشیان دەدەمەوە، بێگومان هەر ئەوانن سەرکەوتو رزگاربو لە سزا و تولەی من.

(١١٢) ﷲ پێی فەرمون: چەند ساڵ لە زەویدا ژیاوون؟

(١١٣) وتیان: رۆژێك یان تاقێك لە زەویدا بوین جا پرسیار لە حیسابگەران بکە، چونکە ئێمە هەر ئەوەندە دەزانین.

(١١٤) ﷲ دەفەرموێ: ئێوە جگە لە ماوەیەکی کەم لەدنیادا نەبوون، ئای ئێوە ئەم راستیەتان بزانیایە، بەڵام ئێوە ئەو ژیانە کەمتانە بەلاوە زۆر بوو لەبیری ئەم ژیانەی دوارۆژدا نەبون تا ئەمرۆ بەو ژیانە نالەبارە گەیشتن.

(١١٥)ئایا ئێوە بەلاتانەوە وابو کە ئێمە هەروا بە بێ سودو بێمەبەست ئێوەمان دروستکردوە؟ خۆ ئێوە دڵنیابون کە ناهێنرێنەوە بۆلای ئێمە بۆ حیسابوکیتابو پاداشتو سزا؟

(١١٦)جا ئەو (ﷲ)یەی کە پاشای راستەقینەیە دوورە لەوەی کە کاری بێهودەی ئاوا بکاتو ئێوەی بۆ گاڵتەو گەمە دروست کرد بێت، جگە لەو زاتەی کە پەروەرندەو خاوەنی تەختی بەرێزە کە ﷲ یە هیچ پەرستراوێکی راستەقینەی تر نیە.

(١١٧)ئەوسا هەر کەسێك لەگەل (ﷲ)دا هانا بۆ کەسێکی تر ببات هیچ بەڵگەیەکی لەسەر راستی ئەو ئیشەی نیە، جا ئەوە حیسابی هەر لەلای پەروەردگاری خۆیەتی، بێگومان بڕیار ئەوەیە کە بەو ئیشەی کافر دەبێو کافرانیش لەسزا رزگار نابن.

(١١٨)جا بڵێ: ئەی پەروەردگارم لێم خۆشبەو رەحمم پێبکە چونکە تۆ لە هەمو خاوەن بەزەییەکان بە بەزەیو بەرەحم تری.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {الراحِمُونَ يَرْحَمُهُمْ الرحْمَنُ ارْحَمُوا مَنْ فِي الْأَرْضِ يَرْحَمْكُمْ مَنْ فِي السمَاءِ الرحِمُ شُجْنَةٌ مِنْ الرحْمَنِ فَمَنْ وَصَلَهَا وَصَلَهُ اللهُ وَمَنْ قَطَعَهَا قَطَعَهُ اللهُ /الترمذي وغ ە/

ئەوانەی کەرەحمو سۆزیان هەیە خوا رەحمیان پێ دەکات، رەحم بکەن بەوانەی کە لەسەر زەویدان ئەوەی کەلە ئاسمانە رەحمتان پێ دەکات، رەحم تێکەڵاوە لەوەسفی رەحمان جا هەر کەسێك پەیوەندی خزمایەتی بداتە سەر خوایش سۆزی خۆی بۆ دەباتە سەر، وەهەر کەسێکیش بیبچڕێنێت خوایش ئەو لەرەحمی خۆی دەبچڕێنێت}.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (١) الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَةٌ مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ (٢) الزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَالزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَا إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ (٣) وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدًا ۚ وَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٤) إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا مِن بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٥) وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ ۙ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ (٦) وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَتَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِن كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ (٧) وَيَدْرَأُ عَنْهَا الْعَذَابَ أَن تَشْهَدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ ۙ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ (٨) وَالْخَامِسَةَ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِن كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ (٩) وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ وَأَنَّ اللَّهَ تَوَّابٌ حَكِيمٌ (١٠)

## ٢٤ سورەتی نور ٦٤

سورەتی نور سورەتی بیستوچوارەمی قورئانە، شەستوچوار ئایەتە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، لەم سورەتەدا باسی روداوی (**الإفك**) هاتوە کەلە ساڵی چوارەمی کۆچی پاش غەزای بەنی موستەلیق رویدا هەروەها وتراوە ئایەتی﴿ وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاءُ إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ ۙ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ ﴾ النور: ٦

لە ساڵی نۆی کۆچی پاش غەزای تەبوك دابەزیوە کەواتە ئەم سورەتە ماوەیەکی درێژی بردوە تا بەتەواوی دابەزیوەو بە ئاماژەی پێغەمبەر ئایەتەکانی لە شوێنی خۆیاندا دانراون. وشەی(**نور**) حەوت جار لەم سورەتەدا هاتوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەمە سوڕەتێکەو رەوانمان کردوە، جا بڕیارەکانی ناوی ئەم سورەتەمان دیاریو پێویستکردوەو چەندین نیشانەی رۆشنمان تێیدا ناردۆتە خوارەوە بەڵکو ئێوە بیر بکەنەوەو پەندی لێوەربگرن.ئینجا ﷲ بڕیارەکانی باسدەکاودەفەرموێ:

(٢) ئافرەتی داوێن پیسو پیاوی داوێن پیس هەر کاتێ ئەو ئیشە ناپەسەندەیان ئەنجامدا ـ ئەگەر لە پێش ئەمەدا هاوسەری حەڵاڵیان نەبو بێت ـ ئەوە لە هەریەك لەو دووانە سەد شەلاق

بدەن ئەگەر باوەڕتان بە اللَّهُو بە ڕۆژی قیامەت هەیە، وە بۆ بە جێ هێنانی بریاری اللَّهُ بەزەیتان بەواندا نەیەتەوە، جا با کۆمەڵێك لە باوەڕداران ئامادەی سزا دانی ئەو دوانە ببێت بۆ ئەوەی سام لەو کردارە خراپە بکرێتو ئەوانیش زیاتر شەرمەزارو تەمێ ببنو بڕیارەکەی اللَّهُیش بە بێ زیادو کەم جێبەجێ بکرێت.

(٣) بەزۆری پیاوی زیناکار جگە لە ئافرەتی زیناکارو موشریك ناخوازێت، وە ئافرەتی زیناکاریش هەر پیاوی زیناکار یان موشریك دەی خوازێت، وە ئەم نیکاحە لەسەر باوەڕداران قەدەغە کراوە. کەوابو ئەگەر ئافرەتێکی داوێن پاك بە پیاوێکی زیناکار ڕازی ببێت بۆ نیکاح ئەوە یان موشریکەو باوەڕی بە بڕیاری اللَّهُ نیە یان زیناکارە ئەگینا چۆن ڕازییە بە پیاوێکی زیناکار، وە هەروەها بە پێچەوانەیشەوە. هەندێکیش وتویانە مەبەست لە﴿وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ زینا قەدەغەکراوە لەسەر باوەڕداران.

(٤) جا ئەو کەسانەی کە بۆ ئافرەتانی پاك داوێن بوختان دەکەن، پاشان لەسەر ڕاستی ئەو قسەیان چوار شایەتیان نەهێنا، ئەوسا ئەبێ هەشتا شەلاقیان لێبدەن، وە هەرگیز شایەتیان لێوەرنەگرن. چونکە ئەوانە خۆیان بەوروەوشتە ناپەسەندەیان لە سنوری متمانە پێکردن تێپەڕیون.

(٥)مەگەر ئەو کەسانەی کە پەشیمان ببنەوە لەدوای ئەو بوختانەو خۆیان بە کرداری چاكودروست باش بکەنەوە ئەوسا بێشك اللَّهُ چاوپۆشیکەرو دلۆڤانە بۆ بەندەکانی. اللَّهُ لەم بڕیارەدا کێشەی ژنو مێرد جیا دەکاتەوەو دەفەرموێ:

(٦) ئەوانەی کە بوختان بۆ ژنی خۆیان دەکەنو جگە لە خۆیان هیچ شایەتێکی تریان نیە، ئەوسا پێویستە بۆ شایەتی، هەر یەك لەوانە چوار جار خوا بە شایەت بگرێو بڵێ خوا شایەت بێ کە بە بێدرۆ ئەو لە ڕاستگۆیانەو ئەم قسەیەم درۆی تێدا نیە، جاهەر بەمەش کار کۆتایی نایەت، وەك دەفەرموێ:

(٧) دەبێ بۆ پێنجەمین جار بڵێت: کە نەفرینی اللَّهُی لەسەر بێ ئەگەر لەم قسەیەدا ئەو لەدرۆزنان بوبێت. بەم شێوەیە پیاوەکە لە هەشتا شەلاقی بوختان ڕزگاری دەبێو ژنەکە تاوانبار دەکرێت، جا ئەگەر دانی پێدا نا یان قسەی نەکرد ئەوە سەنگسار دەکرێت، بەڵام ئەگەر دانی پێدا نەنا ئەوە ماڤی پارێزگاری لە خۆی پێدەدرێت وەك دەفەرموێ:

(٨)چوار جار خوا بە شایەتی گرتنی ئافرەتەکە لەسەر ئەوەی کە ئەو پیاوە لە درۆزنانە سزا لەسەر ئافرەتەکەش لا دەباتو سەنگسار ناکرێت بەو مەرجەی کە:

(٩)پێنجەمین جار ئافرەتەکە بڵێت: ئەگەر ئەو پیاوە لە ڕاستگۆیان بێ ئەوە بەر ڕقوقینی خوا کەوم. بەم شێوەیە هەردوو لەسزای دنیا ڕزگار دەبن وبۆ هەمیشە لەیەك حەرام دەبن جا ئەگەر دوگیانیش بێ منداڵەکە هی ئەو پیاوە نیەو بە ئافرەتەکە دەدرێت، ئینجا اللَّهُ ئەفەرموێ:

(١٠) ئەگەر چاکەی اللَّهُ نەبوایە بۆ ئێوەو ڕەحمی پێ نەکردنایە، ڕاستیەکەی دەردەخستو هەر لە دنیادا شەرمەزاری ئەکردن بەڵام لەگەڵ ئەو هەمو تاوانانەی کە بەندە دەیکات هێشتا اللَّهُ نایەوێ ئابڕویان ببات، وە بە ڕاستی اللَّهُ بە زۆری پەشیمانی وەر دەگرێتو زۆر دانایە لە ئیشەکانیدا، جا ئەم بڕیارە دەمکوتێکیشە بۆ ئەوانەی کە دەڵێن دادگای ئیسلامی ماڤی بە ئافرەت نەداوە، چونکە لێرەدا هەر وەك پیاو بۆی بو کە بە چوار سوێندو نەفرینێك لە خۆی، لە سزای بوختان ڕزگار ببێت ئافرەتیش بە هەمان شێوە بە چوار سوێندو نەفرینێك لە خۆی، لە سزای زینا ڕزگار دەبێت.

لە ئیبنوعەباسەوە هاتوە کە هلالی کوڕی ئومەیە لەلای پێغەمبەرداﷺ داوێنپیسی ژنەکەی خۆی لەگەڵ شەریکی کوڕی سەحمادا باسکرد { فَقَالَ النبِي الْبينَةُ أَوْ حَد فِي ظَهْرِكَ قَالَ يَا رَسُولَ اللهِ إِذَا رَأى أَحَدُنَا رَجُلًا عَلى امْرَأتِهِ يَلْتمِسُ الْبينَةَ فَجَعَلَ النبِي ﷺ يَقُولُ الْبينَةُ وَإلا فَحَد فِي ظَهْرِكَ فَقَالَ هِلَالٌ وَالذِي بَعَثَكَ بِالْحَق نَبِيا إني لَصَادِقٌ وَلَيُنْزِلَن اللهُ فِي أَمْرِي مَا يُبرئُ بِهِ ظَهْرِي مِنْ الْحَد فَنَزَلَتْ وَالذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُمْ شُهَدَاءُ إِلا أَنْفُسُهُمْ فَقَرَأَ حَتى بَلَغَ مِنْ الصادِقِينَ فَانْصَرَفَ النبِي ﷺ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِمَا فَجَاءَا فَقَامَ هِلَالُ بْنُ أُمية فَشَهِدَ وَالنبِي ﷺ يَقُولُ اللهُ يَعْلَمُ أَن أَحَدَكُمَا كَاذِبٌ فَهَلْ مِنْكُمَا مِنْ تَائِبٍ ثُم قَامَتْ فَشَهِدَتْ فَلَما كَانَ عِنْدَ الْخَامِسَةِ أَن غَضَبَ اللهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنْ الصادِقِينَ وَقَالُوا لَهَا إِنهَا مُوجِبَةٌ قَالَ ابْنُ عَباسٍ فَتَلَكأَتْ وَنَكَصَتْ حَتى ظَنَنا أَنهَا سَتَرْجِعُ فَقَالَتْ لَا أَفْضَحُ قَوْمِي سَائِرَ الْيَوْمِ فَمَضَتْ فَقَالَ النبِي ﷺ أَبْصِرُوهَا فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ الْعَيْنَيْنِ سَابِغَ الْأَلْيَتَيْنِ خَدَلجَ الساقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ فَجَاءَتْ بِهِ كَذَلِكَ فَقَالَ النبِي ﷺ لَوْلَا مَا مَضَى مِنْ كِتَابِ اللهِ لَكَانَ لِي وَلَهَا شَأنٌ /ابوداود.صحه الالبا / جا پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: یا شایەت بێنە یان تازیانەت لێدەدرێت، واتە: هەشتا تازیانەی بوختان، ئەوسا ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ هەرکاتێ کەسێك لە ئێمە یەکێکی دی لەسەر ژنەکەی، جا دەبێ بچێت بە شوێن شایەت دا بگەڕێت؟! جا پێغەمبەر ﷺ هەر دەیفەرمو: شایەت یان تازیانە. ئینجا هلال وتی: بەو کەسەی کە تۆی بە ڕاستی ناردوە من ڕاستگۆمو دڵنیام کە اللَّهُ شتێك دەنێرێ کە پشتم بپارێزێ لەم دارلێدانە. ئەوسا ئەم ئایەتانە دابەزین﴿ئەوانەی کە بوختان بۆ

ژنی خۆیان ده‌كه‌نو جگه له خۆیان هیچ شایه‌تێكی تریان نیه - جا خوێندییه‌وه هه‌تا گه‌یشته- ئه‌گه‌ر له‌راستگۆیان بێت ﴿ خۆئیتر پێغه‌مبه‌رﷺ وازی له‌قسه‌ی پێشو هێناو ناردی به شوێن هه‌ردووكیاندا ئینجا هلال هه‌ستاو شایه‌تی خۆی . به‌و شێوه‌ی كه له ئایه‌ته‌كه‌دا هاتوه . داو پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموی: به راستی اللّٰه ده‌زانێ كه یه‌كێكتان درۆ ده‌كه‌ن، جا كامتان په‌شیمان ده‌بنه‌وه؟ پاشان ئافره‌ته‌كه‌ش هه‌ستاو به‌و جۆره شایه‌تی داو كاتێ گه‌یشته پێنجه‌م وه‌ستاندیانو وتیان: به راستی ئه‌و نه‌فرینه ده‌بێت به هۆی سزا، ئیبنوعه‌باس ده‌ڵێت: ئه‌و ئافره‌ته له گۆ كه‌وتو پاشه‌وپاش هاته‌وه تا وامان گومان برد كه له قسه‌ی خۆی په‌شیمان ده‌بێته‌وه، پاشان وتی: هۆزی خۆم بۆ هه‌مو كاتێ ئابڕو نابه‌م جا له‌سه‌ر قسه‌ی خۆی ڕۆی، ئینجا پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموی: ته‌ماشا بكه‌ن جا ئه‌گه‌ر منالێكی چاوره‌شی سمت قه‌ڵه‌وی قولاڵری بو ئه‌وه له شه‌ریكی كوڕی سه‌حمایه، خۆپاشان منالێكی به هه‌مان شێوه‌ی بو، ئینجا پێغه‌مبه‌رﷺ فه‌رموی: ئه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی له په‌رواكه‌ی خوادا بوو پیش نه‌كه‌وتایه ئه‌وه بریاری من له‌گه‌ل ئه‌ودا جوریكی‌تر ده‌بو}.

إِنَّ ٱلَّذِينَ جَآءُو بِٱلْإِفْكِ عُصْبَةٌ مِّنكُمْ ۚ لَا تَحْسَبُوهُ شَرًّا لَّكُم ۖ بَلْ هُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ ۚ لِكُلِّ ٱمْرِئٍ مِّنْهُم مَّا ٱكْتَسَبَ مِنَ ٱلْإِثْمِ ۚ وَٱلَّذِى تَوَلَّىٰ كِبْرَهُۥ مِنْهُمْ لَهُۥ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١١﴾ لَّوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ ظَنَّ ٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بِأَنفُسِهِمْ خَيْرًا وَقَالُوا۟ هَٰذَآ إِفْكٌ مُّبِينٌ ﴿١٢﴾ لَّوْلَا جَآءُو عَلَيْهِ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَآءَ ۚ فَإِذْ لَمْ يَأْتُوا۟ بِٱلشُّهَدَآءِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ عِندَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٣﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ لَمَسَّكُمْ فِى مَآ أَفَضْتُمْ فِيهِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٤﴾ إِذْ تَلَقَّوْنَهُۥ بِأَلْسِنَتِكُمْ وَتَقُولُونَ بِأَفْوَاهِكُم مَّا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ وَتَحْسَبُونَهُۥ هَيِّنًا وَهُوَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمٌ ﴿١٥﴾ وَلَوْلَآ إِذْ سَمِعْتُمُوهُ قُلْتُم مَّا يَكُونُ لَنَآ أَن نَّتَكَلَّمَ بِهَٰذَا سُبْحَٰنَكَ هَٰذَا بُهْتَٰنٌ عَظِيمٌ ﴿١٦﴾ يَعِظُكُمُ ٱللَّهُ أَن تَعُودُوا۟ لِمِثْلِهِۦٓ أَبَدًا إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧﴾ وَيُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ ٱلْفَٰحِشَةُ فِى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ وَأَنَّ ٱللَّهَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٢٠﴾

﴿١١﴾ به راستی ئه‌وانه‌ی كه ئه‌و درۆو بوختانه‌یان كرد تاقمێك بوون له خۆتان ئه‌وه بۆ خۆتان به خراپی مه‌زانن، به‌ڵكو ئه‌وه چاكه بۆتانو هۆی تاقیكردنه‌وه‌ی راستو ناراستانه‌و جیا كه‌ره‌وه‌ی په‌یره‌وانی سوننه‌ت ودژ به سوننه‌تانه، بۆ هه‌مو كه‌سێك له‌وانه ئه‌وه‌ی كه كردویه‌تی له تاوانی ئه‌م بوختانه‌ی بۆ هه‌یه، وه ئه‌و كه‌سه‌ی كه به‌شی گه‌وره‌ی ئه‌و تاوانه‌ی هه‌ڵگرت له‌ناو ئه‌واندا سزایه‌كی گه‌وره‌ی بۆ هه‌یه. ئه‌م شانزه ئایه‌ته ده‌رباره‌ی دایكی باوه‌ڕداران عایشه(خوا لێی رازی بێت) هاتوته خواره‌وه كه رووداوكه به‌م شێوه بووه كه دایكمان عایشه خۆی بۆمان باس ده‌كاتو ده‌ڵێ: پێغه‌مبه‌ری خواﷺ هه‌ركاتێ بیویستایه بچێت بۆ كاروانیه‌ك تیروپشكی ده‌كرد له‌نێوان خێزانه‌كانیدا هه‌ر كامیان ده‌رچونایه ده‌یبرد له‌گه‌ل خۆیدا، عایشه ده‌ڵێت: له‌م غه‌زایه‌دا تیروپشكی كردو من ده‌رچوم، جا منیش له خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خواداﷺ ده‌ر چوم كه ئه‌م روداوه پاش دابه‌زینی ئایه‌تی په‌رده (**الحجاب**) بو، جا من له كه‌ژاوه‌یه‌كدا سوار ده‌كرامو له رۆیشتندا له ناویا ده‌بوم جا كاتێك كه پێغه‌مبه‌رﷺ له‌و غه‌زایه لێ بوویه‌وه‌و گه‌ڕایه‌وه‌و نزیك بونه‌وه له مه‌دینه شه‌وێك بڕیاری رۆیشتنی كاروانه‌كه‌ی دا، جا كاتێ كه بڕیاری رۆیشتنیان درا منیش بۆ ده‌ست گه‌یاندن به ئاو رۆیشتم تا له سوپاكه دور كه‌وتمه‌وه، ئه‌وسا كاتێ كه هاتمه‌وه لای بنه‌و بارگه‌ی خۆم ده‌ستم له سینگه‌مدا دیم كه گه‌ردنبه‌نه‌كه‌م له مل دا نه‌ماوه له‌به‌رئه‌وه گه‌رامه‌وه بۆ دۆزینه‌وه‌ی گه‌ردن به‌نه‌كه‌مو به دواداگه‌رانی كه‌بو به‌هۆی دوا كه‌وتنم، وه ئه‌و تاقمه‌ی كه كه‌ژاوه‌كه‌یان سوار ده‌كرد كه‌ژاوه‌كه‌ی منیان سوار كرد له‌سه‌ر ئه‌و وشتره‌ی كه سواری ده‌بووم، وه ئه‌وان وایان زانی بو كه منی تێدایه- ژنان ئه‌و كاته سوكبونو زه‌به‌لاحو گۆشتن نه‌بون، چونكه شتی كه‌میان له خواردن ده‌خوارد، له‌به‌رئه‌وه ئه‌و تاقمه‌ش كاتێ كه كه‌ژاوه‌كه‌یان بار كرد بو له قورسیه‌كه‌ی نه‌كه‌وتبونه شكه‌وه‌و منیش كچێكی تازه پێگه‌یشتو بوم، جا ئیتر وشتریان هه‌ڵساند بوو رۆیشتبون، منیش پاش رۆیشتنی سوپاكه گه‌ردنبه‌نه‌كه‌م دۆزیه‌وه‌و هاتمه‌وه جێگه‌كه‌یانو كه‌سی تێدا نه‌بو، جا چوومه‌وه ئه‌و جێگایه‌ی كه تێیدا بوم چونكه ده‌مزانی ئه‌و خه‌ڵكه به‌م زوانه ده‌زانن كه منیان ون كردوه‌و ده‌گه‌ڕێنه‌وه بۆلام، جا له كاتێكدا كه من له شوێنی خۆمدا دانیشتبوم، خه‌و زۆری بۆ هێنامو خه‌وتم سه‌فوانی كوڕی موعه‌ته‌ل له پاش سوپاكه ده‌هات، جا كه هاته لای جێگه‌كه‌مو تاپۆی كه‌سێكی خه‌وتوی دی، هاته لامو دیمیو ناسیمی، چونكه ئه‌و پیش ئه‌وه‌ی كه ئایه‌تی په‌رده بێت منی دی بو، جا منیش به وشه‌ی ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾ ی ئه‌و خه‌به‌رم بوویه‌وه‌و به سه‌رپۆشه‌كه‌م ده‌موچاوی خۆمم داپۆشی، سوێند به اللّٰه یه‌ك قسه‌ی له‌گه‌ڵدا نه‌كردم و یه‌ك قسه‌یشم لێ نه‌بیست بێجگه له وتنی: ﴿ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيْهِ رَٰجِعُونَ ﴾ تا وشتره‌كه‌ی بۆ یبخ كردمو منیش سوار بوم، ئینجا ره‌شۆی وشتره‌كه‌ی به ده‌سته‌وه بو تا گه‌یشتینه سوپاكه كه له گه‌رمای نزیكی نیوه‌ڕۆدا خستبویان،

جا لەبارەی منەوە تیا چو ئەوەی کە تیا چو، بوختان دەستی پێکرد. وە ئەوەی کە بەشی گەورەی لەو بوختانەی هەلگرت عەبدوڵای کوڕی ئوبەیی کوڕی سەلولی دوورو بو، جا کاتێك کە گەیشتمەوە مەدینەو مانگێك نخۆشبوم هەر لەگەل گەیشتنەوەمدا – خەڵکیش لەبارەی قسەی تاقمی درۆزنەوە باسیان دەکرد، بەڵام من هیچ شتێکم هەست پێ نەکرد بو، ئەوەی بەلامەوە جێگەی گومان بو ئەوە بو کە پێغەمبەری خواﷺ وەکو جارانیتر کە نخۆشبوم لەو نخۆشییەمەدا زۆر بە لەوزو مۆت نەبو، پێغەمبەری خواﷺ تەنها دەهاتە لامو سەلامی دەکردو دەیووت چۆنی؟ جا ئەوە دەیخستمە گومانەوە هەستم بە هیچ خراپەیەك نەدەکرد، تا پاش ئەوەی کە بەرەو چاکی دەڕۆیشتم، جارێك کە بۆ دەست بە ئاو بۆ ناوچەی (مەناسیع) ئەچووم‌و دایکی (میستەح)م لەگەڵدابو – دەر نەئەچوین مەگەر شەواوشەو ئەویش پێش ئەوەی کە ئاودەست لە نزیك ماڵەکانمانەوە دروست بکەین، ئیشمان ئیشی عەرەبەکانی پێشوبو پێمان ناخۆشبو کە ئاودەست لەناو ماڵماندا بێت، جا منو دایکی میستەح چوین کە کچی ئەبو روهمی کوڕی موتەلیبی کوڕی عەبدو مەناف بو دایکی کچی سەخری کوڕی عامر خوشکی دایکی ئەبوبەکری سدیق بو کوڕەکەی میستەحی کوڕی ئەساسەی کوڕی عەبادی کوڕی موتەلیبە – جا منو کچی ئەبوروهم کاتێ لە ئیشی خۆمان بوینەوەو بەرەوماڵ هاتینەوە، دایکی میستەح پێی لە عەباکەی گیراو کەوتو وتی : بمریت ئەی میستەح، جا پیم وت: قسەیەکی خراپت کرد: قسە بە پیاوێك دەڵێیت کە ئامادەی بەدر بوە؟ وتی: ئەی نەزان، ئەی تۆ نەت بیستوە کە ئەو چی وتوە؟ وتم: ئەو چی وتوە؟ جا دەنگو باسی درۆزنانی بۆ باس کردم ئینجا نەخۆشیەکەم زیاتری کرد، جا کاتێ گەڕامەوە ماڵ پێغەمبەری خواﷺ هاتەلامو سەلامی کردو پاشان فەرموی چۆنیت؟

وتم :ڕێم پێ دەدەیت بچمەوە لای باوکو دایکم چونکە من ئەم ویست لەوانەوە لەم دەنگو باسە باش تێ بگەم – جا پێغەمبەری خواﷺ ڕێی پێدام – ئینجا هاتمەوە لای باوکو دایکم، وتم بە دایکم ئەی دایکی خۆم: خەڵك چی دەڵێن؟

وتی : ئەی کچی خۆم، هێواش‌و لەسەر خۆت بە، بە ﷲ کەم بوە ئافرەتێکی شۆخوشەنگ لەلای پیاوێکدا بێت کە هەوێی هەبێ‌و خۆشی بوێت مەگەر زۆر قسەی پڕوپوچیان وت بێت لەبارەیەوە وتی: پاکیو بێگەردی بۆ خوا؟ ئایا خەڵك ئەم قسەیە دەکات؟! جا وتی: ئەو شەوە تا بەیانی نە خەوم لێکەوت ونە فرمێسکم وشك بویەوە هەر دەگریام پاشان ئەو ڕۆژەیشم هەر بەگریان بردە سەر، ئینجا پێغەمبەری خواﷺ لەو کاتەدا وەحی بۆ نەهاتو عەلیو ئوسامەی کوڕی زەیدی بانگ کردو لەبارەی جیا بونەوەی

خێزانیەوە پرسو ڕای پێکردن، وتی: ئوسامەی کوڕی زەید بەوەی کە دەیزانی لە دوری خێزانی لەو بوختانەو ئەو خۆشەویستیەی کە هەیبو بۆیان وتی: ئەی پێغەمبەری خواﷺ ئەوان خاووخێزانی تۆن جگە لە چاکە هیچیتر نازانین لەبارەیانەوە، بەڵام عەلی کوڕی ئەبوتالب وتی: خوا تەنگانەی دانەناوە بۆ تۆو جگە لەو ژنان زۆرن‌و ئەگەر پرسیار لەو کەنیزە بکەی ڕاستیت پێدەڵێت، وتی: جا پێغەمبەری خواﷺ بەریرەی بانگ کردو فەرموی: ئەی بەریرە ئایا لە عایشەوە شتێکت دیوە کە بتخاتە گومانەوە؟ بەریرەیش پێی وت: بەو کەسەی کە تۆی بە ڕاستی ڕەوانە کردوە هەرگیز هیچ عەیبێکم لێنەدیوە زیاد لەوەی کە کچێکی منداڵەو لە کاتی هەویر شێلاندا خەوی لێدەکەوت و کارەساوا ومریشكو شت دەهاتنو هەویرەکەیان دەخوارد، جا پێغەمبەریﷺ هەستاو لەناو یارەکانیدا لەسەر مینبەردا فەرموی: کێ داوای لێبوردنم لێ دەکات لەبارەی پیاوێکەوە – عەبدوڵای کوڕی ئوبەی- کە لەبارەی خاو خێزانمەوە ئازاری داوم؟ بەخوا جگە لەچاکە لەبارەی خێزانمەوە شتێکیتر نازانم‌و پیاوێکیان باسکردوە جگە لە چاکە لەویش شتیتر شك نابەم ولەگەل خۆمدا نەبێ نەهاتۆتە ناو خێزانی من، ئینجا سەعدی کوڕی موعازی یاریدەر هەستاو وتی: من داوای چاوپۆشی لەتۆ ئەکەم لەبارەی ئەوەوە ئەی پێغەمبەری خواﷺ، ئەگەر لەتیرەی ئەوس بوایە لەگەردنمان دەدا ولە برا خەزرەجیەکانمانەو ئەگەر بفەرمویت وای لەگەڵدا ئەکەین، وتی: جا سەعدی کوڕی عوبادە کە گەورەی خەزرەجیەکان بو هەستاو هەرچەند پیاوێکی چاکبو بەڵام دەمارگیری هەڵینا لەسەر ئەوەو بە سەعدی کوڕی مەعازی وت: بەخوا نایکوژیتو ناتوانی بیکوژیت، ئینجا ئوسەیدی کوڕی حوزەیر کە ئامۆزای سەعدی کوڕی مەعاز بو هەستاو بە سەعدی کوڕی عوبادەی وت : درۆ ئەکەیت، بەخوا دەیکوژین، تۆ مونافیقیتو پارێزگاری لە مونافقان دەکەیت، بەخوا دەیکوژین جا ئەو دووتیرەی ئەوس‌و خەزرەجە لەیەك هەستانو خەریك بو لەیەکتر بدەن وپێغەمبەری خواﷺ لەسەر مینبەر بو هەر خەریکی هێواش کردنەوەیان بوو بە دەم‌و بەئیشارەتی دەست تا بێدەنگبونو پێغەمبەریشﷺ بێدەنگ بو، وتی: ئەو ڕۆژەش تا شەوو ئەو شەوەی دووهەمیش تارۆژ بویەوە نەخەوتم‌و فرمێسکم وشك نەبوویەوەو هەر دەگریام‌و باوکو دایکم پێیان وابو کە ئەو گریانە دڵم لەت دەکات، وتی: لە کاتێکدا کە هەردووکیان لەلام دانیشتبون ومن دەگریام، ئافرەتێکی یاریدەدەر (الانصاریە)ماوەی لێخواستم کە بێتەلام منیش ڕێم پێداو جا دانیشت لە گەڵما دەگریا، لەو کاتەدا کەئێمە ئاوا بوین پێغەمبەری خواﷺ هاتە لامانو سەلامی کردو پاشان دانیشت، لەو کاتەی کە

ئەو قسەیەم لە بارەوە کرابو لەلام دانەنیشتبو مانگێکی پێچو لەبارەی منەوە وەحی بۆ نەهات، وتی:پێغەمبەری خواﷺ کاتێ دانیشت حەمدو سوپاسی خوای کردو شایەتی راستەقینەی بۆ لێداو پاشان پاش سەلامو تەحیەبۆ ﷲ وتی: { يَا عَائِشَةُ فَإِنَّهُ بَلَغَنِي عَنْكِ كَذَا وَكَذَا فَإِنْ كُنْتِ بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُكِ اللهُ وَإِنْ كُنْتِ أَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللهَ وَتُوبِي إِلَيْهِ فَإِن الْعَبْدَ إِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِهِ ثُمَ تَابَ تَابَ اللهُ عَلَيْهِ/واتە: ئەی عایشە من لەبارەی تۆوە ئەوەو ئەوەم پێگەیشتووە جا ئەگەر تۆ بێتاوان بی بەم زوانە ﷲ پاکانەییت بۆ ئەنێرێ‌وبێتاوانیت دەرئەخات. وە ئەگەر تاوانێکیشت کردوە داوای لێخۆشبون لە ﷲ بکەو پەشیمان بەرەوە، چونکە بە راستی بەندە هەرکاتێ دانی‌نا بە تاوانیداو پاشان پەشیمان بویەوە ﷲ ئەو پەشیمان بونەوەی لێوەردەگرێت. عایشە وتی: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لەقسەکەی بویەوە فرمێسکم نەما تەنانەت هەستی دڵۆپەیەکیشم نەکرد جا بە باوکمم وت: لە باتی مندا وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوە، وتی: بەخوا نازانم چی‌بڵێم بە پێغەمبەر،جا بەدایکمم وت: وەڵامی پێغەمبەری خوا ﷺ بدەرەوەو ئەویش وتی: بەخوا نازانم چی بڵێم بە پێغەمبەری خوا ﷺ، وتی: منیش وتم من کچێکی تازە پێگەیشتوم زۆر لەقورئان شارەزا نیم، سوێند بە ﷲ من دەزانم کە ئێوە ئەمەتان بیستووە لە دڵتاندا جێگیر بوەو باوەڕتان پێ‌کردوە. وە ئەگەر من بڵێم پاکم لەوقسەیە کەﷲ دەزانێ من پاکم، باوەڕم پێناکەن وە ئەگەر دان بنێم بە شتێکدا کە خوای گەورەو بەشکۆ ئاگادارە کە من دورم لەوە باوەڕم پێئەکەن، بە ﷲ من بۆ خۆم وبۆ ئێوە وێنەیەك نابینم جگە لەوەی کە باوکی یوسف وتی:﴿ ئیشم خۆگرتنێکی جوانە هەرخوا یارمەتی دەرە لەسەر ئەوەی کە ئێوە باسی دەکەن﴾ یوسف: ١٨. عایشە وتی: پاشان پشتم هەڵچەرخاندو لەسەر جێگەکەی خۆم راکشام، وتی: بە خوا من ئەو کاتە دەمزانی کە بێتاوانم‌و دڵنیا بووم کە ﷲ بێتاوانیم دەردەخات بەڵام سوێندبە ﷲ گومانم نەدەکرد لەبارەی منەوە وەحی بێت‌و بخوێنرێتەوە، خۆم لەوە کەمتر دەگرت کە ﷲ لەبارەی منەوە بە شێوەیەك بدوێ کە بخوێنرێتەوە. بەڵام من چاوەڕوانبوم کە پێغەمبەری خواﷺ خەوێك ببینێ کە ﷲ بێتاوانی منی بۆ دەربخات، سوێند بە ﷲ هێشتا پێغەمبەری خواﷺنەیویستبو لەجێگەی خۆیی هەڵسێ‌و هیچ کەسیش لەخەڵکی ئەم ماڵە نەچونە دەرەوە تا ﷲ پەیامی ناردە لای پێغەمبەرەکەی‌و نارەحەتی‌و قورسی هاتنی وەحی، پێغەمبەری داگرت کە زۆر توندو بەهێز بو تارادەیەك کە لە ساردترین رۆژدا ئارەق لە نێوچاوانی وەك مرواری دەهاتە خوارەوە، جا کاتێك وەحیەکە لەسەر پێغەمبەریﷺ تەواو بو لەو حاڵەدا کە پێدەکەنی، یەکەم قسەی ئەوەبو کە وتی:{ يَا عَائِشَةُ احْمَدِي اللهَ فَقَدْ بَرأَكِ اللهُ/ مژدەت لێ بێ ئەی عایشەو سوپاسی ﷲ بکە بێگومان کەﷲ بێ تاوانی تۆیی راگەیاند} جا دایکم پێی وتم : هەڵسە بچۆ لای پێغەمبەرو سوپاسی بکە، جا وتم: بەﷲ ناچمە لای‌و سوپاسی جگە لەﷲیش ناکەم. جا دە ئایەتی سەبارەت بە پاکو خاوێنی من رەوانە کرد}

(١٢) ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوە بۆ کاتێك کە ئەو هەواڵە پیسەتان بیست پیاوانی باوەڕدارو ئافرەتانی باوەڕدار گومانی چاکیان بە براو خوشکی خۆیان نەبردو نەیان وت : ئەمە درۆیەکی رونەو نابێ باس بکرێت؟!

(١٣)دەی ئەگەر راست ئەکەن با چوار شایەتیان هەبوایە، جا چونکە راستیان نەکردو شایەتیان نەهێنا بو، خۆ بیانەوێ یان نەیانەوێ لەلای ﷲ هەر ئەوانەن درۆزن.

(١٤) ئەوسا ئەگەر چاکەی ﷲ نەبوایە بۆ ئێوەو لە دنیاو قیامەتا رەحمی پێ‌نەکردنایەو بەزەیی پێتاندا نەهاتایەوە، چاك بزانن لەبەر ئەو درۆیەی کە دەمەودەمتان پێدەکرد سزایەکی گەورەتان پێدەگەیشت.

(١٥) ئەوکاتەی کە ئەم درۆتانە لەیەکتر وەردەگرت‌و بە زمان‌و دەمتان دەتان وتەوە بە بێ ئەوەی کە شتێکی لێ بزانن، جا بە شتێکی سوك‌و ئاسانتان دەزانی وپێتان وایە وتنی ئەو درۆ ناڕەوایە ئاسانە لە کاتێکدا ئەو بوختانە لەلای ﷲ زۆر گەورەیە.

(١٦) ئەوە بۆ کاتێ ئەوەتان بیست نەتان وت: بۆ ئێمە رەوا نیە لە بارەی ئەم بوختانەدا قسەی ئاوا بکەین؟ ئەی ﷲ ئاوا بوختانێك بە ماڵی هەڵبژاردەو نوێنەری زمان پاكو رەوشت بەرزت بکرێت نیشانەی تانەو تەشەردانە لەو نوێنەرەی کە هەڵت بژاردوەو رەوانەت کردووەو رەخنەیە لە کاری تۆ بەڵام تۆ لە هەمو بڕیارو کردارتا پاکو بێ عەیبی‌و نا بێ ئەو ماڵە هەڵبژاردەی تۆ ئاوا عەیبێك روی تێ‌بکات، وە ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەیە سەبارەت بەوئافرەتە پاك‌وبەرێزەو ئەوبنەماڵە گەورەو بەنرخە.

(١٧) ﷲ ئامۆژگاریتان دەکات کە ئیتر هەرگیز قسەی ئاوەها نەکەن‌و نەگەڕێنەوە بۆ تاوانی ئاوەها ئەگەر ئێوە باوەڕدارن، ئاشکرایە نەوەکانی (عەبدوڵای کوری سەبە) ئەم مەرجەیان تێدا نیەو گوێیان بە ئەم ئامۆژگاری ﷲیە نەداوەو ئیستاش هەر بەردەوامن لە سەر ئەو بوختانە گەورەیە، بەڵکو لەویش خراپتر زانای! شیعە (رجب البرسی) لە کتێبی (مشارق أنوار اليقين)دا باس دەکات‌و دەڵێ: (إن عائشة جَمَعَت أربعين ديناراً مِن خِيانة/

۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّبِعُواْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ وَمَن يَتَّبِعۡ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِۚ وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَرَحۡمَتُهُۥ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنۡ أَحَدٍ أَبَدٗا وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿٢١﴾ وَلَا يَأۡتَلِ أُوْلُواْ ٱلۡفَضۡلِ مِنكُمۡ وَٱلسَّعَةِ أَن يُؤۡتُوٓاْ أُوْلِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينَ وَٱلۡمُهَٰجِرِينَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلۡيَعۡفُواْ وَلۡيَصۡفَحُوٓاْۗ أَلَا تُحِبُّونَ أَن يَغۡفِرَ ٱللَّهُ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿٢٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ٱلۡغَٰفِلَٰتِ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ لُعِنُواْ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ يَوۡمَ تَشۡهَدُ عَلَيۡهِمۡ أَلۡسِنَتُهُمۡ وَأَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٤﴾ يَوۡمَئِذٖ يُوَفِّيهِمُ ٱللَّهُ دِينَهُمُ ٱلۡحَقَّ وَيَعۡلَمُونَ أَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ ٱلۡمُبِينُ ﴿٢٥﴾ ٱلۡخَبِيثَٰتُ لِلۡخَبِيثِينَ وَٱلۡخَبِيثُونَ لِلۡخَبِيثَٰتِۖ وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِۚ أُوْلَٰٓئِكَ مُبَرَّءُونَ مِمَّا يَقُولُونَۖ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَرِزۡقٞ كَرِيمٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَاۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾

عایشەی خێزانی پێغەمبەرﷺ بە زینا چل دیناری کۆکردووەتەوە)

ئێمەش دەڵێین: ﴿ سُبۡحَٰنَكَ هَٰذَا بُهۡتَٰنٌ عَظِيمٞ ﴾ النور: ١٦/ تۆ لە هەموو بڕیارو کردارتا پاکو بێعەیبی، ئەمە بوختانێکی زۆر گەورەیە) وەبەڵگەی خوانەناسی بوختانکەرانە.

﴿١٨﴾ جا اللَّهُ نیشانەکانی ڕۆشن دەکاتەوە بۆتان تا بیزانن‌و پەیڕەوی بکەن‌و نەکەونە ناو تاوانی ئاوەها گەورەوە، خۆ اللَّهُ زۆر زانایە بە کارەکانتان‌و دانایە بەو شتانەی کە بۆتان دیاری دەکات‌و بەجێیە بڕیارەکانی.

﴿١٩﴾ ئینجا اللَّهُ هەڕەشە لەو کەسانە دەکات کە دەیانەوێ کۆمەڵگای ئیسلامی ناشیرین‌و عەیبداربکەن‌و دەفەرموێ: بە بێگومان ئەو کەسانەی کە پێیان خۆشە کاری داوێنپیسی لەناو باوەڕدارانندا بڵاو ببێتەوە، ئەوانە سزایەکی دەردناکیان لە دنیاو لە پاشەڕۆژدا بۆ هەیە، خۆ اللَّهُ دەزانێ کە ئەوتاوانە چەندە گەورەیە، لەکاتێکدا ئێوە نازانن، جا ئەم سزاو هەڕەشە توندە بۆ ئەوانەیە کە پێیان خۆشە کاری داوێنپیسی بڵاو ببێتەوە ئەی ئەبێ سزای ئەو کەسانە چۆن بێت کە خۆی خەریکی بڵاوکردنەوەی بێت؟!

﴿٢٠﴾ئەوسا ئەگەر چاکەو سۆزی اللَّهُ بەسەر ئێوەدا نەبوایە لە سەر ئەو تاوانە سزای توندی دەدان‌و ڕسوای دنیاو دوا ڕۆژی دەکردن، بەڵام باش بزانن کە بێگومان اللَّهُ میهرەبان‌و دڵۆڤانە بۆیە ئاوەها چاوپۆشی لێکردن.

﴿٢١﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە دوای هەنگاوەکانی شەیتان مەکەون‌و پەیڕەوی لێ نەکەن، چونکە هەر کەسێك پەیڕەوی هەنگاوەکانی شەیتان بکات‌و بە شوێنیا بڕوات ئەوسا ئەو ڕەحمی پێناکات، بەڵکو بێگومان ئەو فەرمانی داوێنپیسی و کاری خراپی بەسەردا دەدات‌و سەرئەنجام شەرمەندەو ڕسوای دنیاو قیامەتی دەکات‌و تۆڵەی باوە گەورەی لێدەکاتەوە، خۆ ئەگەر چاکەو بەزەیی اللَّهُ نەبوایە بۆتان هەرگیز هیچ کەسێك لە ئێوە پاك نەدەبووەوە بەڵام اللَّهُ هەرکەسێکی ئارەزۆ لێ بێت لە تاوان پاکی دەکاتەوەو دەیبەخشێت، ئەوسا اللَّهُ بیسەری هەموو قسەکانتانە، جا ئاشکرا بێت یان پەنامەکی، وە زانەرە بە هەموو هەڵس‌و کەوتێکتان.

﴿٢٢﴾ با ئەوانەی کە خاوەن چاکەن لەناو ئێوەداو خوا پێیداون‌و هەیانە، سوێند نەخۆن لەسەر ئەوەی کەشت نەدەن بە خزمان‌و بێ نەوایان‌و کۆچکەرانی ڕێگای اللَّهُ، با چاوپۆشی بکەن‌و لە هەڵەکانیان ببورن‌و باسیان نەکەن ئایا پێتان خۆش نیە کە اللَّهُ لێتان خۆشببێت؟بەدڵنیاییەوە کە اللَّهُ زۆر چاوپۆشیکەرەو بینیهایەت میهرەبانە. هۆی دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوە بوکە ئەبوبەکر- خوالێی ڕازی بێت - یارمەتی (میستەح)ی خزمی کە کۆچەری‌و کەمدەست بو دەدا، جا چونکە لە بڵاوکردنەوەی بوختان بۆ عایشەی دایکی باوەڕدارانندا - خوالێی ڕازی بێت - (میستەح)یش یەکێك بو لەوانە، بۆیە ئەبوبەکریش - خوالێی ڕازی بێت - سوێندی خوارد کە ئیتر یارمەتی نەدات، بەڵام اللَّهُ ئەم ئایەتەی نارد، ئینجا ئەبوبەکر وتی : بەرێ وەڵڵاهی لێ خۆشبونی خوام پێخۆشە، مەرج بێت هەروەکو پێشو یارمەتی بدەم‌و هەرگیز لێی نەبڕم.

﴿٢٣﴾بێگومان ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی پاك داوێنی بێ ئاگای باوەڕدار، ئەوانە دور کراون لە ڕەحمەتی اللَّهُ لەدنیاو لەدوا ڕۆژداو سزایەکی یەکجار گەورەیان بۆ هەیە.

﴿٢٤﴾لە ئەو ڕۆژەدا کە زمانیان‌و دەستیان‌و پێکانیان لە سەر ئەوەی کە دەیکەن شایەتیان لێ دەدەن، جا ئەو ڕۆژە هەرچییان کردوە ئاشکرا دەبێت.

﴿٢٥﴾ لەو ڕۆژەدا اللَّهُ جەزایەکی دادپەروەرانەیان پێدەدات، وە ئەو کاتە دەزانن بە بێگومان کە اللَّهُ هەر خۆی ڕاستەو ڕۆشنکەرەوەی ڕاستو ناڕاستەو بەهانە بڕی تاوانبارانە.

(٢٦) هەر چی ئافرەتی پیسە بۆ پیاوانی پیسەو هەرچی پیاوانی پیسیشە بۆ ئافرەتانی پیسەو هەرچی ئافرەتی پاکە بۆ پیاوانی پاکەو هەرچی پیاوانی پاکیشە بۆ ئافرەتانی پاکە،خۆ خانەوادەی پێغەمبەرﷺ و ئەبوبەکر پاکن‌و دوورن لەو بوختانەی کە ئەوان دەیلێن بەڵکو بۆ ئەوان لێخۆشبونی ﷲو ڕۆزییەکی بەرێز هەیە. دیارە سەروەری پاکان پێغەمبەری خوایەﷺ و خیزانەکانیشی پاکترینی ئافرەتانن، جا تەماشا بکەن‌و بزانن کە شیعە چەند تاوانبارو بێباوەڕن بەم قورئانە ئەوان ئەو ئیفتراو بوختانەی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی مونافق بۆ عایشە بە راستو دروست دادەنێن بەڵام باوەڕیان بە پاکانەی ﷲ نیە، جا ئەگەر عایشە بە قسەی ئەوان داوێن پیسە دەبێ بڵێن پێغەمبەریشﷺ وایە یان پێغەمبەر لەم ئایەتە تێ نەگەیشتوە یان لەم بارەوە بەگوێی خوای نەکردوە؟ جا کامیان دەڵێن با بڵێن یەکێکیان بەسە بۆ کافر بوونو دەرچون لە ئیسلام، جا یان ﷲ ژێیریان کاتو ڕێنمای ڕێگای راستیان بکات ئەگەر نەزانن‌و بەتەمای خراپەو دژایەتی ئایین نین ئەگینا ﷲ وەك عەبدوڵای مامۆستایان رسوایان بکاتو لەناویان ببات، بەراستی ئەمانە بەدرێژای مێژوی ئیسلام دوژمنی ڕێگای راست بون‌و خەنجەرێکی ژەهراوی وکوشندە بوون لە پشتەوە بۆ موسڵمانان، قازی ئەبو یەعلا دەڵێت:"مَن قَذَفَ عائِشَةَ ا بَرأها ا ُ مِنهُ كَفَرَ بِلا خِلافٍ" /الصارم المسلول/ هەرکەسێك بوختان بکات بۆ عائیشە ـ خوالێی رازی بێت ـ بەوەی کە ﷲ پاکانەی بۆ کردوە بە بێ هیچ ناکۆییەك کافر بوە"وە هەروەها ئیبنو حەجەری هەیتەمی دەڵێت: "عُلِمَ مِن حديثِ الإفكِ أن مَن نَسَبَ عائشةَ إ الزنا كان كافراً، وقد صَرحَ بِذلك أئِمَّتنا وغ ُهُم لأن ذلكَ تَكذِيبُ النصُوصِ القرآنيةِ، وَمُكَذِّبُها كافرٌ بإ اعِ ا سلم َ"/ الصواعق ا رقة/ واتە: لە حەدیسی ئیفکەوە دەزانرێت کە بێگومان هەرکەسێ کاری خراپو داوێن پیسی پاڵ بداتە لای عایشە، ئەو کەسە کافرە. وە پێشەوایانی ئێمەو جگە لەوانیش ئەمەیان بە راشکاوی وتووە چونکە لەوەدا بە درۆ خستنەوەی دەقەکانی قورئانە. خۆ هەر کەسیش دەقەکان بەدرۆ بخاتەوە بەکۆی دەنگی موسڵمانان (الاجماع) کافرە".

(٢٧) ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە جگە لەماڵی خۆتان نەچنە هیچ ماڵێکی ترەوە تا خۆتان دەناسێنن‌و ئیجازە دەگرن‌و سەلام دەکەن لە خەڵکی ئەو ماڵە، ئەوە چاکە بۆ ئێوە بەشکم ئێوەیش دەرسو ئامۆژگاری لێ وەربگرن، نەکەن هەروا لە خۆتانەوە خۆتان بکەن بە ژوردا ئەوەکارێکی ناپەسەندەو زۆرجاریش دە بێ بەهۆی شەرمەندەیی‌و خەمێکی هەمیشەیی.

فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدٗا فَلَا تَدۡخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤۡذَنَ لَكُمۡۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ﴿٢٨﴾ لَّيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ مَسۡكُونَةٖ فِيهَا مَتَٰعٞ لَّكُمۡۚ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴿٢٩﴾ قُل لِّلۡمُؤۡمِنِينَ يَغُضُّواْ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِمۡ وَيَحۡفَظُواْ فُرُوجَهُمۡۚ ذَٰلِكَ أَزۡكَىٰ لَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴿٣٠﴾ وَقُل لِّلۡمُؤۡمِنَٰتِ يَغۡضُضۡنَ مِنۡ أَبۡصَٰرِهِنَّ وَيَحۡفَظۡنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنۡهَاۖ وَلۡيَضۡرِبۡنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّۖ وَلَا يُبۡدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوۡ ءَابَآئِهِنَّ أَوۡ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآئِهِنَّ أَوۡ أَبۡنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوۡ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ إِخۡوَٰنِهِنَّ أَوۡ بَنِيٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوۡ نِسَآئِهِنَّ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيۡرِ أُوْلِي ٱلۡإِرۡبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفۡلِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يَظۡهَرُواْ عَلَىٰ عَوۡرَٰتِ ٱلنِّسَآءِۖ وَلَا يَضۡرِبۡنَ بِأَرۡجُلِهِنَّ لِيُعۡلَمَ مَا يُخۡفِينَ مِن زِينَتِهِنَّۚ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٣١﴾

(٢٨) جا ئەگەر کەستان تێدا نەبینی‌و چۆڵ بو نەکەن بچنە ناویەوە هەتا ڕێگەتان پێ‌نەدرێت، بە راستی سەر بەخۆچونە ژورەوەی ئەم جۆرە جێگایانە ئایندەی چاك نابێت، جا ئەگەر پێتان وترا بگەڕێنەوە ئەوسا ئێوەیش بگەڕێنەوە بە بێ‌ئەوەی کە دلگران ببن، چونکە ئەوە چاك‌و پاکترە بۆتان لە قسەو قسەڵۆك هەڵبەستن بۆ یەکتر، خۆ ﷲ زۆر زانایە بەوەی کە ئێوە ئەیکەن.

(٢٩) هیچ تاوانێکتان لەسەر نیە کە بچنە ماڵێکەوە کە کەسی تێدا نەبێتو کەل‌وپەلی خۆتانی تێدا بێت ئەوسا ﷲ دەزانێ بەئەوەی کە ئێوە ئاشکرای دەکەن‌و ئەوەش کە دەیشارنەوەو هیچی لێ ون نابێ‌و دەزانێت کە بەچ نییەتو مەبەستێك دەچنە ناو ئەو ماڵانەوە.

(٣٠) ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ بە پیاوانی باوەڕدار بڵێ: با چاویان لە ئاستی نامەحرەم داخەن‌و شەرمگای خۆیان بپارێزن لە داوێن پیسی‌و خراپە ئەوە خاوێنترو پاکترە بۆ خۆیان‌و کۆمەڵگایان، بێگومان ﷲ زۆر ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.

(٣١) جا بە ئافرەتانی باوەڕداریش بڵێ: چاویان لە ئاستی پیاوانی نامەحرەمدا داخەن‌و شەرمگای خۆیان بپارێزن لە داوێن پیسی‌و خراپە، وەبا خشڵی خۆیان دەرنەخەن مەگەر ئەو خشڵانەی کە بە دەرەوەیە با بە سەرپۆشیان سەرو یەخەو سنگیان داپۆشن، وە با خشڵی خۆیان دەرنەخەن مەگەر بۆ مێردیان یان لای

وَأَنكِحُواْ ٱلۡأَيَٰمَىٰ مِنكُمۡ وَٱلصَّٰلِحِينَ مِنۡ عِبَادِكُمۡ وَإِمَآئِكُمۡۚ إِن يَكُونُواْ فُقَرَآءَ يُغۡنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٞ ﴿٣٢﴾ وَلۡيَسۡتَعۡفِفِ ٱلَّذِينَ لَا يَجِدُونَ نِكَاحًا حَتَّىٰ يُغۡنِيَهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ وَٱلَّذِينَ يَبۡتَغُونَ ٱلۡكِتَٰبَ مِمَّا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَكَاتِبُوهُمۡ إِنۡ عَلِمۡتُمۡ فِيهِمۡ خَيۡرٗاۖ وَءَاتُوهُم مِّن مَّالِ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ ءَاتَىٰكُمۡۚ وَلَا تُكۡرِهُواْ فَتَيَٰتِكُمۡ عَلَى ٱلۡبِغَآءِ إِنۡ أَرَدۡنَ تَحَصُّنٗا لِّتَبۡتَغُواْ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَمَن يُكۡرِههُّنَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ مِنۢ بَعۡدِ إِكۡرَٰهِهِنَّ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكُمۡ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖ وَمَثَلٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلِكُمۡ وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾ ۞ ٱللَّهُ نُورُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ مَثَلُ نُورِهِۦ كَمِشۡكَوٰةٖ فِيهَا مِصۡبَاحٌۖ ٱلۡمِصۡبَاحُ فِي زُجَاجَةٍۖ ٱلزُّجَاجَةُ كَأَنَّهَا كَوۡكَبٞ دُرِّيّٞ يُوقَدُ مِن شَجَرَةٖ مُّبَٰرَكَةٖ زَيۡتُونَةٖ لَّا شَرۡقِيَّةٖ وَلَا غَرۡبِيَّةٖ يَكَادُ زَيۡتُهَا يُضِيٓءُ وَلَوۡ لَمۡ تَمۡسَسۡهُ نَارٞۚ نُّورٌ عَلَىٰ نُورٖۚ يَهۡدِي ٱللَّهُ لِنُورِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَيَضۡرِبُ ٱللَّهُ ٱلۡأَمۡثَٰلَ لِلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٣٥﴾ فِي بُيُوتٍ أَذِنَ ٱللَّهُ أَن تُرۡفَعَ وَيُذۡكَرَ فِيهَا ٱسۡمُهُۥ يُسَبِّحُ لَهُۥ فِيهَا بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ﴿٣٦﴾

باوكیان یان باوكی مێردیان یان لای كوڕانیان یان كوڕانی مێردیان یان لای براكانیان، یان كوڕانی براكانیان یان كوڕانی خوشكیان یان لای ژنانی هاو باوەڕی خۆیان یان غوڵامانێك كەبوون بەموڵكیان، یان ئەو پیاوانەی كە هەمیشە لەو ماڵەدانو هیچ نیازێكیان بە ژن نیە، جا لەبەر هەر هۆیەك بێ یان لای ئەو منااڵانەی كە نەگەیشتونە ئەو تەمەنەی كە ئارەزۆی ژن بكەنو ئاگایان لە شەرمگەی ژنان نییە، وە ژنان لەكاتی ڕۆیشتندا بە جۆرێك پێ بە زەویدا نەدەن كە خشڵی شاراوەیان وەك: خرخاڵو پاوەن بزرنگێتەوەو پێی بزانرێت، ئەی باوەڕداران بەرەو لای ﷲ بگەڕێنەوەو لە هەڵەو تاوان پەشیمان ببنەوەو تەوبە بكەن، بەڵكو سەركەوتو ڕزگاربن. ئەوەیە ئەركی ئافرەتانی خاوەن باوەڕو لادان لەو خۆچواندنە بە كافرو خوانەناسانەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:{ مَنْ تَشَبَهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنْهُ /ابوداود، صحيحه الالبا / هەركەسێك خۆی بچوێنێ بەگەلێكەوە لەگەل ئەودا حیسابی بۆدەكرێت}

﴿٣٢﴾ هاوسەر بۆ پیاوانی بێژنو ژنانی بێمێردی ناوخۆتان پەیدا بكەن، هەروەها بۆ چاكان لە بەندەكانتانو كەنیزەكانتان. واتە: با كەس بە بێ هاوسەرو ڕەبەن نەمێنێتەوە، جا ئەگەر كەمدەستبون ﷲ بە چاكەی خۆی بێنیازیان دەكات، وە بەخششی ﷲ فرەوانە لە بۆ بەندەكانیو ﷲ زۆر زانایە بە بارودۆخی ژیانیان، ئەمە بۆ ئەو كەسانەیە كە هەر ئەوەندەیان هەیە كە ژن بهێننو لەوە زیاتر شتێكی وایان نیە، بەڵام بۆ ئەوانەی كە هەرهیچیان نەبێ دەفەرموێ:

﴿٣٣﴾ با ئەوانەی كە توانای ماڵیان نیە بۆژن هێنان خۆیان بگرن تا ﷲ لە چاكەی خۆی بێنیازیان دەكات، وە ئەو بەندەو كەنیزانە كە داوای كڕینەوەی خۆیان دەكەن، جا ئێوەش ئەگەر زانیتان ماڵ پەیدا دەكەنو لێیان دەوەشێتەوە بۆ خۆ كڕینیان ماوەیان بۆ دیاری بكەنو بۆیان بنوسن، وە ئەی باوەڕداران لەو ماڵەی كە ﷲ پێیداون پێیان بدەن، واتە: یان لەوەی بۆتان داناون كەمی بكەنەوە یان ماڵیان پێبدەن تا بتوانن خۆیان ئازاد بكەن، هەر وەك دەزانن كە زەكاتدان واجبەو بەشێكی بۆ ئازاد كردنی ئەو بەندەو كەنیزانە دانراوە. لە فەرمودەدا هاتوە كە پێغەمبەری خواﷺفەرمویەتی:{ ثَلَاثَةٌ حَق عَلَى اللهِ عَز وَجَل عَوْنُهُمْ الْمُكَاتَبُ الذِي يُرِيدُ الْأَدَاءَ وَالناكِحُ الذِي يُرِيدُ الْعَفَافَ وَالْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ اللهِ./ الترمذي والنسائي وابن ماجه. حسنه الالبا / واتە: سێ كەس هەن كە ﷲ پێویستی كردوە لەسەر خۆی كە یارمەتیان بدات: ئەو بەندەو كەنیزەیە كە لەگەل خاوەنەكەیدا ڕێك دەكەوێت كە خۆی بكڕێتەوە، وە ئەو كەسەی كە ژن دەهێنێو مەبەستی پاكداوێنیە، مادام توانایی مارەییەكەی هەبێت، با لە ژیانی ئایندەی نەترسێت چونكە ﷲ یارمەتی دەریەتی. وە ئەوەی كە لە ڕێگای ﷲدا دەجەنگێت}.

ئینجا ﷲ ڕێگە بەو نەفس نزمانە نادات كە ئەو كەنیزانە لەداوێن پیسیدا بە كار بهێنن بۆ بەدەست هێنانی سەروەتو سامانو دەفەرموێ: نەكەن كە زۆر بكەن لە كەنیزەكانتان بۆ داوێن پیسی لە كاتێكدا كە ئەوان خۆیان بە ئارەزۆی خۆیان خۆ دەپارێزن لەو كارە پیسە، ئەگەر چی ئافرەتو كۆیلەیشن بەڵام تۆ پیاویو ئازادی كەچی دەتەوێت بەو ئیشە پیسە سەروەتو سامانی دنیایت دەسكەوێت؟! جا هەر كەسێك زۆر لەوان بكاتو توشی زینایان بكات با ئەو كەنیزانە لەسۆزی ﷲ نائومێد نەبن، بێگومان كە ﷲ پاش ئەوەی كە ناچاریان كردوون زۆر لێخۆشبوو بێنیهایەت میهرەبانەو لە تاوانو خراپەكانیان خۆشدەبێو تاوانیان هەرلە سەر ئە وكەسانەیە كە زۆریان لێ كردوون.

﴿٣٤﴾ جا بەحەقیقەت ئێمە نیشانە گەلێكی ڕوشنكەرەوەمان ناردوەتە لاتان كە قورئانە، وە بەسەرهاتو وێنە گەلێكی زۆر لەو كەسانەی كە لەپێش ئێوەدا ڕۆیشتوون باسمان كردوە بۆتان. وە بۆ ئەوانەی كە پارێزكارنو خۆیان لە دژایەتی فەرمانی خواو پێغەمبەرەكەیﷺ پاراستوە ئامۆژگاری گرنگمان ڕەوانە كردوە، ئاشكرایە كە قورئان ئامۆژگاریو دەرسە بۆ هەموو كەسێك، بەڵام

چونکە هەر خواناسانی راست سودی لێ وەردەگرن وەك ئەوە وایە کە هەر بۆ ئەوان هات بێت.

(٣٥) ﷲ روناکی ئاسمانانو زەوییە، وێنەی نوری ئەو وەك تاقێکە کە هەمو لای گیراوە جگە لە یەك لا نەبێت کە ئەو تاقە چرایەکی تێدا بێتو ئەو چرایەش لە شوشەیەك دابێتو ئەو شوشەیەش لەپاكوخاوێنیداوەك ئەستێرەیەکی زۆر روناك بدرەوشێتەوە، بە رۆنێك هەڵگرێت کە لە درەختی پڕ پیتو بەرەکەت بێ، درەختی زەیتونێك کە بەردەوام تیشکی خۆر لێی بدات کە رۆنەکەی بێ ئەوەی ئاگری پێ بگات ئەوەندە پاكو پاڵفتەیە کە نزیکە خۆی روناکی بدات، روناکی لەسەر روناکی، جاﷲ کێی ئارەزوو لێبێت رێنمایی دەکات بۆ ئەو روناکی ونورەی خۆی. جا ﷲ وێنەکان دەهێنێتەوە بۆ خەڵك بۆ ئەوەی پەندو ئامۆژگاری لێبگرنو ببێتە مایەی خۆشبەختی هەر دوو دنیایان، خۆ ﷲ زانیاری هەیە بەسەر هەمو شتێکداو نە گەورە نە بچوك هیچی لێ ون نابێت. جا ئەم نمونەی کە ﷲ لەم وێنەدا باسی دەکات تێمان دەگەیەنێت کە نوری ﷲ روناکییەکیی واتاییەو بە چاوی سەر هەستی پێ ناکرێت، شێوەی ئەم وێنە وەك لایتێکی شوشەیی پاكو شەوقنە کە روناکییەکەی بە بێ بڵاو بونەوەی بێ سەرو بەر بە یەك لایەنی راستدا دەرواتو هەر کەس لەو راستایە بێت با دوریش بێ لێی ئەو روناکییەی پێدەگات، بەڵام ئەگەر لەو راستایەدا نەبێت بەملاو بەولادا بڵاو بوو بێتەوە ئەو روناکیە هەست پێ ناکات، ئەگەر چی زۆر نزیکیش بێت لەو لایتە روناکەوە، جا واتێدەگەم کە ئەو نورەی ﷲ بۆ مرۆڤیش هەر ئاوەهایە، خۆ ئەو کەسەی کە روبەروی ئەو نورە بوەستێت دەیدۆزێتەوە ئەگەرچی لێیشی دور بێت کەمو زۆر تامو چێژی ئەو روناکیە دەکات، جا ئەم خەڵکەیش سەبارەت بەنوری ﷲ هەربەو شێوەیەن ئەگەر لەراستای نوری ئەودا وەستان هەرچەند لەپلەیەکی زۆر نزمیشدا بن لەبەندایەتیدا، ئەو نوورو روناکیە وەردەگرێت جائەو هێڵە راستەی کە روبەڕومان ئەکاتەوە لەو نورەی ﷲ پەیڕەوی قورئانو سوننەتی پێغەمبەرەﷺ و لادان لەو دووانەکەوتنە ناو تاریکیو رێ لێ ونبوونە، بۆیە دەبینین ئەوانەی کە گەیشتن بەمانگ بەو عیلمو زانستییە لە خۆیان بای بون لەو نورو روناکی ئیمانە بێبەهرە بون بەڵام شوانێك هەر بە بیرکردنەوە لە ئاشەوانێك تێدەگا کە ئەم بونەوەرە بەدیهێنەرێکی هەیە کە تاكو تەنیایە. جا هەندێك وتویانە ئەو تاقە،دڵی باوەڕدارە کە بە نووری ئیمان دەدرەوشێتەوە. والله اعلم، جا ﷲ لەوەسفی ئەو کەسانەی کەئەم روناکییە دەدۆزنەوە دەفەرموێ:

رِجَالٌ لَّا تُلْهِيهِمْ تِجَٰرَةٌ وَلَا بَيْعٌ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَإِقَامِ ٱلصَّلَوٰةِ وَإِيتَآءِ ٱلزَّكَوٰةِ ۙ يَخَافُونَ يَوْمًا تَتَقَلَّبُ فِيهِ ٱلْقُلُوبُ وَٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٣٧﴾ لِيَجْزِيَهُمُ ٱللَّهُ أَحْسَنَ مَا عَمِلُوا۟ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ يَرْزُقُ مَن يَشَآءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٣٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَعْمَٰلُهُمْ كَسَرَابٍۭ بِقِيعَةٍ يَحْسَبُهُ ٱلظَّمْـَٔانُ مَآءً حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَهُۥ لَمْ يَجِدْهُ شَيْـًٔا وَوَجَدَ ٱللَّهَ عِندَهُۥ فَوَفَّىٰهُ حِسَابَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ سَرِيعُ ٱلْحِسَابِ ﴿٣٩﴾ أَوْ كَظُلُمَٰتٍ فِى بَحْرٍ لُّجِّىٍّ يَغْشَىٰهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِۦ سَحَابٌ ۚ ظُلُمَٰتٌۢ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَآ أَخْرَجَ يَدَهُۥ لَمْ يَكَدْ يَرَىٰهَا ۗ وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ ٱللَّهُ لَهُۥ نُورًا فَمَا لَهُۥ مِن نُّورٍ ﴿٤٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱلطَّيْرُ صَٰٓفَّٰتٍ ۖ كُلٌّ قَدْ عَلِمَ صَلَاتَهُۥ وَتَسْبِيحَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِمَا يَفْعَلُونَ ﴿٤١﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُزْجِى سَحَابًا ثُمَّ يُؤَلِّفُ بَيْنَهُۥ ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ رُكَامًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِنۢ بَرَدٍ فَيُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ وَيَصْرِفُهُۥ عَن مَّن يَشَآءُ ۖ يَكَادُ سَنَا بَرْقِهِۦ يَذْهَبُ بِٱلْأَبْصَٰرِ ﴿٤٣﴾

(٣٦) لە ناو ماڵ گەلێکدا کە ﷲ رێی داوە کە بەرز بکرێتەوەو رێزی لێ بگیرێتو تێیدا یادی ناوی ئەو بکرێت کە مزگەوتەکانە، بە بەیانیانو بەئێواران ناوی ﷲ بە پاکی دەبەنو لە دەریایی یادی ﷲدا مەلەوانی دەکەنومەلەوان ئاسا وچان نادەن.

(٣٧) کە پیاوانێکن کە بازرگانیو مامەڵە لە یادی ﷲو نوێژ کردنو زەکات دان بێئاگایان ناکاتو دەترسن لە رۆژێك کە دڵەکانو چاوەکان لەو رۆژەدا دەگۆڕێنو دڵەکان لەرزیان لێ دەنیشێتو چاوەکان بەم لاولادا دەڕوانن تا بزانن چییان بۆدێو بەرەو کوێ دەبرێن.

(٣٨) تا ﷲ بە جوانتر لەوەی کە خۆیان کردویانە پاداشیان پێ بداتەوەو لە چاکەی خۆی بۆیشیان زیاد بکات، خۆ ﷲ بۆ ئەو کەسانەی کە ئارەزۆی لێ بێ بێ ژمارە پاداشیان دەداتەوە. ئەمە باسو پاداشتی ئەو کەسانە بو کە دڵیان بە نوری ﷲ روناك بووەتەوە،

(٣٩) ئینجا باسی بێباوەڕانێ کە پێیان وایە ئیشو کردارەکانیان دەبێت بە هۆی خەیرو بەرژەوندیان، دەکاتو دەفەرموێ: ئەوسا ئەوانەی کە بێباوەڕ بوون کردارەکانیان وەك تراویلکەیە لە دورەوە تینو بەئاوی دەزانێت وبۆی دەچێت کە پێی دەگات هیچی دەست ناکەوێت، هەروەها کافریش کاتێك کە بە خوای خۆی دەگات هیچ شتێکی چاکی نیە کە سودی لێ وەرگرێت. جا ﷲ بە

يُقَلِّبُ ٱللَّهُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٤﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٖ مِّن مَّآءٖۖ فَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ بَطۡنِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰ رِجۡلَيۡنِ وَمِنۡهُم مَّن يَمۡشِي عَلَىٰٓ أَرۡبَعٖۚ يَخۡلُقُ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٤٥﴾ لَّقَدۡ أَنزَلۡنَآ ءَايَٰتٖ مُّبَيِّنَٰتٖۚ وَٱللَّهُ يَهۡدِي مَن يَشَآءُ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٦﴾ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلۡحَقُّ يَأۡتُوٓاْ إِلَيۡهِ مُذۡعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرۡتَابُوٓاْ أَمۡ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَرَسُولُهُۥۚ بَلۡ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوۡلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحۡكُمَ بَيۡنَهُمۡ أَن يَقُولُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخۡشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقۡهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ وَأَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ لَئِنۡ أَمَرۡتَهُمۡ لَيَخۡرُجُنَّۖ قُل لَّا تُقۡسِمُواْۖ طَاعَةٞ مَّعۡرُوفَةٌۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٥٣﴾

تێرو تەسەلی حیسابی کرداره خراپەکانی بۆ دەکات ئینجا دەزانێ چی کردوە. خۆ ﷲ زوویش حیساب تەواودەکات.

(٤٠) یان وەك ئەو تاریکاییانە کە لە دەریایەکی بێ بندا کە شەپۆل لەسەر شەپۆل دای پۆشیوەو لەسەریشەوە هەورێکی ئەستورو تاریك بێت کە تاریکاییەکان هەندێکیان لەسەر هەندێکیانن‌و بە شێوەیەك تاریك بێت کە ئەگەر دەستی خۆی دەربهێنێ وەختە نەیبینێتەوە، جا ئەم مرۆڤە دواکەوتوە نەزانە ئاوایەو نازانێ چی پێ دەکەن‌و بۆ کوێی دەبەن هەموی لەلا تاریکە. بە راستی هەر کەسیك کە ﷲ روناکی پێ نەدات‌و رێگای راستی نەگرتبێ هیچ روناکیەکی نیەو دۆڕاوو لەناوچوە ئەوەش سەرئەنجام‌و پاشە رۆژی بێباوەڕان‌و پەیڕەوانیانە.

(٤١) ئەی بینەر ئایا تۆ نابینی ئەوەی کە لە ئاسمانان‌و زەویدایە پاك‌و بێگەردی ﷲ نیشان دەدات‌و ئەو باڵندەی کە لە حەواوە رادەوەستن‌و باڵەکانیان درێژ دەکەنەوە، بەراستی هەمویان دەزانن چۆن لە ﷲ بپاڕێنەوەو پاك‌و خاوێنی ئەو زاتە پیشان بدەن‌و تەسبیحاتی بکەن خۆ ﷲ یش دەزانێ کە ئەوان چی دەکەن.

(٤٢) جا هەر بۆ خوایە خاوەندارێتی ئاسمانان‌و زەوی‌و هیچ هاوبەشێکی نیە، ئەوسا گەڕانەوەش هەر بۆ لای ﷲیە. ئەی مرۆڤ هەرچی ببی‌و هەرچی بکەیت بە خۆت‌و کردارتەوە دەبێ بچیتەوە بەردەم خوای گەورەو خاوەن دەسەڵات تا تۆڵەی خراپەکانت لێ وەرگرێت‌و پاداشی چاکەکانت بداتەوە، ئینجا ﷲ باسی بەشێکی‌تر لەو شتانە دەکات کە بەڵگەی توانایی‌و هێزی ئەو زاتەیەو دەفەرموێ:

(٤٣) ئەی بینەر ئایا نابینی کە ﷲ چۆن پاڵ بە هەورەوە دەنێت کاتێ کە پارچەی بچوك بچوکە، پاشان دەیان داتە دەمی یەك‌و پاشان تەپەیان دەداتە سەریەك‌و دەیانکات بە هەورێکی ئەستور، ئەوسا دەبینی کە دڵۆپەی باران لە نێوانیەوە دەردەچێت، وە لەو هەورانەی کە وەکو چیاوان لەو سەرەوە تەرزە دەبارێنێ، ئەوسا ئەو تەرزە ئەدا بەسەر ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێ دوچاری زیانی دەکات‌و دەبێ بە بەڵایەك بۆی و لای دەدات لەو کەسەیش کە ئارەزۆی لێیە وەکو بەزەیی‌و سۆزێك بۆی، یان هەردوو بە پێچەوانەوە، خەریکە روناکی بزیزکەکەی چاوەکان کوێر بکات ئەوەندە بە پەلەو روناکە، بە راستی هەر ئەو ئاو راگرتنە لەو بەرزاییەو دڵۆپە دڵۆپە کردنی لەکارە زۆر گرنگ‌و سەرسوڕهینەرەکانە بۆ کەسێك کە تۆزێك عەقڵی هەبێ.

(٤٤) ﷲ شەووڕۆژ بە دوای یەکدا دێنێ، جا بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ هەندێ جار یەکسان‌و هەندێ جاریش کەم‌و زیادیان پێدەکات، بێگومان لەوەی کە باسکرا ئامۆژگاری‌و وانەیەکی گەورەی تێدایە بۆ ئەوانەی کە خاوەنی دەرك‌وفامن.

(٤٥) خۆ ﷲ هەمو جانەوەرێکی لە ئاو دروستکردوە، جا هەندێکیان وەك مار لەسەر سك‌و هەندێکیان وەك مرۆڤ‌و باڵندە لەسەر دو قاچ‌و هەندێکیشیان وەکو مەڕومالات لەسەر چوار پێ دەڕۆن، کە ﷲ هەرچییەکی ویست دروستی دەکات، بەدڵنیاییەوە ﷲ زۆر بە توانایە بەسەر هەمو شتێکدا.

(٤٦) بەحەقیقەت ئێمە چەندین نیشانەی رۆشنکەرەوەمان ناردوە بۆ رێنمایی ئێوە ئەی نەوەی ئادەم تا رێگای خۆشبەختی بدۆزنەوەو پەیڕەوی بکەن‌وبەسەریابڕۆن، جا ﷲ ویستی لە سەر هەر کەسێك ببێت رێنمای دەکات بۆ رێگای راست‌و دەیگەیەنێ بە خۆشبەختی هەر دوو دنیا، بەڵێ ﷲ هەر خۆی خاوەنەو هەرچی بکات لە موڵکی خۆیدا راست‌و رەوایەو کەس ناتوانێ نە رێگای لێ بگرێت‌و نە رەخنە، بەڵام ﷲ نە بە زۆر کەس دەخاتە سەر ئایین‌و نە بە زۆر لای دەدات، مرۆڤ خۆی بە ئارەزۆی خۆی لایەك هەڵدەبژێرێ بەڵام ﷲ یارمەتی دەدات چونکە هەر ئەو پەروەردگاریەتی‌و بێ ئەو هیچی پێ ناکرێ کە وابو لەلایەن هەڵبژاردنەوە تەماشا بکەین (الاختیار،الکسب) دەڵێین: مرۆڤ خۆی چاکە دەکات یان خراپە، بەڵام لەلایەن هێزو توانایی‌و رەخساندنەوە تەماشای بکەین کە بە دەست ﷲیە، دەڵێین: ﷲ چاکی بۆکردوە یان خراپی بۆکردوە. ﴿بەراستی ﷲیە کە

خۆتانی دروستکردووەو ئەوەش کە دەیکەن﴾سافات/٩٦. ئەمە شتێکی گرنگەو بیزانەو لە ورتە ورتی شەیتانو شەیتانسیفەتان دورت دەخاتەوە.

(٤٧) جا دەڵێن: باوەڕمان بە اللهو بە پێغەمبەرﷺ هێناوەو پەیڕەویش دەکەین پاشان تاقمێك لەوان پاش ئەو قسەیەی کە دەیڵێن پشت لە ئایین دەکەن‌و گوێ بە فەرمانەکانی نادەن، ئەوسا ئەمانە هەر باوەڕدار نین. هەر ئەوەی کە بە دەم بڵێن ئیماندارین‌و گوێڕایەڵی ئاییینین نا بێ بە بەڵگە لەسەر ئیماندار بونیان بەڵکو پێویستە کردار ئەوراستیەدەری بخات، وەك ئەمانە کە دەڵێن ئیماندارین کەچی الله حوکمی بێباوەڕیان بەسەردا دەدات، بیربکەرەوە هائەوانە چۆن لەدەمیان درایەوە، چونکە بە کردەوە نەیان سەلماندووە رازی بە حوکمو بڕیاری اللهو پێغەمبەرەکەی ﷺ نەبوون.

(٤٨) جا هەر کاتێ ئەوان بۆ لای یاسای اللهو پێغەمبەرەکەیﷺ بانگ بکرێن بۆ ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ بڕیاریان لە نێواندا بدات وراستو ناراستیان لە یەك بۆ جیا بکاتەوە هەر زۆر بە زویی تاقمێکیان خۆیانی لێگێل دەکەن‌و بە لای دا نایەن چونکە خۆیان دەزانن کە ناحەقن و ئەگەر روبەڕو ببنەوە دەیدۆڕێنن.

(٤٩) خۆ ئەگەر مافیشیان هەبێ‌و بزانن لەلای پێغەمبەرو شەرعەوە دەستیان دەکەوێتەوە بە گەردن کەچیەوە دێن بۆ لای‌و دەڵێن: ئێمە بەشەرع دەیکەین‌و دەستێ شەرع ببڕێ خوێنی نیەو خۆیان بە باوەڕدارێکی راستو دروست نیشان دەدەن!

(٥٠) جا الله رقو بڕیاری خۆی سەبارەت بەو تاقمەو وێنەکانی باسدەکاتو دەفەرموێ: ئایا ئەمانە لە دڵیاندا نخۆشی هەیە واتە بێباوەڕو دوورون؟ یان گومانیان هەبوە لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەردا ﷺ؟ یان دەترسن لەوەی کە اللهو پێغەمبەرەکەیﷺ ناهەقیان پێبکەن؟ نەخێر وانیە کە ئەوان بۆی دەچن بەڵکو ئەوان هەر خۆیانن ستەمکار، هەڵویستی دووڕوو دڵ نخۆشەکان سەبارەت بە بڕیاردانی شەرع بەو شیوەیە بو بەڵام هەڵوێستی باوەڕداران گەردنکەچیو متمانە بونە بە خواو بە پێغەمبەرەکەیﷺ.

(٥١) قسەی باوەڕداران هەر کاتێ بانگ بکرێن بۆلای بڕیاری اللهو پێغەمبەرەکەیﷺ بۆ ئەوەی بڕیار بدات لەنێوانیاندا تەنها هەر ئەوەیە کە دەڵێن: بیستمانو بە گوێمان کرد، جا هەر ئەوانەن کە رزگارن، بێگومان رزگاربون لە سزاو گەیشتن بەمەبەست تەنها بۆ ئەوانەیە کە رازین بەشەرعی الله.

قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْهِ مَا حُمِّلَ وَعَلَيْكُم مَّا حُمِّلْتُمْ ۖ وَإِن تُطِيعُوهُ تَهْتَدُوا ۚ وَمَا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ الْمُبِينُ (٥٤) وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي الْأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَىٰ لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُم مِّن بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا ۚ يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا ۚ وَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ (٥٥) وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (٥٦) لَا تَحْسَبَنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مُعْجِزِينَ فِي الْأَرْضِ ۚ وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ ۖ وَلَبِئْسَ الْمَصِيرُ (٥٧) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِيَسْتَأْذِنكُمُ الَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ وَالَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُوا الْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَاةِ الْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ الظَّهِيرَةِ وَمِن بَعْدِ صَلَاةِ الْعِشَاءِ ۚ ثَلَاثُ عَوْرَاتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّافُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمُ الْآيَاتِ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٥٨)

(٥٢) خۆ ئەو کەسەی کە پەیڕەوی اللهو پێغەمبەرەکەیﷺ بکاتو گوێڕایەڵی فەرمانیان بێتو لە الله بترسێو خۆی بپارێزێ لەو شتانەی کە دەبنە هۆی رقوقینی الله، ئەوسا هەر ئەوانەن بەهرەمەندو دورن لە هەموو خراپەیەكو هەموو خۆشییەکیان بۆ هەیە.

(٥٣) الله وەسفێکی تری ئەو بێباوەڕو دووڕوانە باس دەکاتو دەفەرموێ: جا سوێندی سەختیان بە الله خوارد کە ئەگەر هاتو تۆ فەرمانیان پێبکەیت کە دەربچن بۆ غەزا هیچ خۆ ماتەڵ ناکەن‌و ئەو فەرمانەی تۆ جێبە جێ دەکەن، ئەی محمدﷺ بڵێ: سوێند مەخۆن چونکە پەیڕەوی کردنتان زانراوەو لە لای ئێمە شاراوە نیە جگە لە درۆو فێڵو تەڵەکە شتێکیتر نیە، ئێوە هەرگیز قسەو کردارتان یەك نەبوەو درۆزنن یان بڵێ: سوێندی ناوێ ئەگەر راست دەکەن لەمەودوا پەیڕەوییەکی چاك بکەن، بێگومان الله ئاگادارە بەوەی کە ئێوە دەیکەن، پاشان کردەوەکانتان بەڵگەیە لەسەرتان.

(٥٤) بڵێ: پەیڕەوی الله و پەیڕەوی پێغەمبەرﷺ بکەن، جا ئەگەر خۆ دەبوێرن‌و پشت لە فەرمانبەرداریان ئەکەن، ئەوسا پێغەمبەر ﷺتەنها ئەرکی گەیاندنی پەیامەکەی الله ی لەسەرەو ئێوەش تاوانی سەرپێچی خۆتانتان لەسەرە، جا ئەگەر پەیڕەوی بکەن ئەوە ئێوە رێگای هیدایەتتان گرتوەتە بەرو سودی بۆ

خۆتانە. فرستادەی ﷲ کە پێغەمبەرمانﷺ و هەموو پێغەمبەرانیتریشە جگە لە گەیاندنێکی ڕۆشنکەرەوانە هیچیکی تریان لەسەر نیە، ئیتر حیسابو کیتابیان بە دەست ﷲیە. پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {الْجَمَاعَةُ رَحْمَةٌ وَالْفُرْقَةُ عَذَابٌ قَالَ فَقَالَ أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِيُّ عَلَيْكُمْ بِالسَّوَادِ الْأَعْظَمِ قَالَ فَقَالَ رَجُلٌ مَا السَّوَادُ الْأَعْظَمُ فَنَادَى أَبُو أُمَامَةَ هَذِهِ الْآيَةَ/ د، صححه الالبا / یەکریزی موسڵمانان خۆشبەختیەو بەشبەشبونیشی نەگبەتیو سزایە، جا ئەبو ئومامەی باهیلی وتی: پێویستە لە سەرتان بلکێن بە تاپۆی گەورەترەوە، جا پیاوێك بانگی کردو وتی: تاپۆی گەورەتر کامەیە؟ ئەبو ئو مامە بە دەنگی بەرز وەڵامی دایە وەو ئەم ئایەتەی سەرەوەی خوێندەوە} واتە: جەماعەتو تاپۆی گەورەتر بریتیە لە پەیرەویکردنی فەرمانەکانی ﷲو پێغەمبەرەکەی ﷺ با لە ژمارەیش دا کەم بن.

(٥٥) ﷲ بەڵێنی داوە بەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لە ناو ئێوەداو ئیشی چاکیان ئەنجام داوە کە لەم زەوییەدا بیانکات بە جێنشین هەروەکو چۆن ئەوانی پێش ئەمانی کردبوو بە جێنشین، جا سەقامگیری کات بۆیان ئەو ئاینەیان کە ﷲ بۆی هەڵبژاردونو ڕازیە پێی کە ئاینی ئیسلامە، تا پاش ئەو ترسو لەرزەیان ژیانیان بۆ بگۆڕێت بە هێمنیو ئاسایش، وەدەفەرموێ: من بپەرستن، هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی من، کە ئەمە خۆی هۆیەکە بۆ هاتنە دی ئەم بەڵێنە، خۆ هەر کەسێك پاش ئەوەی کە ﷲ ئەم نیعمەتی سەرکەوتنو ئاسایشەی پێدا سپڵەو بێوەفا بو بەرانبەر بە ﷲ ئەوسا ئەوانە فاسقنو دەرچوون لە یاسای ﷲ. لێرەدا ﷲ بەڵێنی سەقامگیربونی دەسەڵاتی باوەڕدارانی بەستوە بەدوو مەرجەوە، یەکەم: بەندایەتی کردنیەتی بە گوێرەی شەریعەتەکەی. دووهەم: هیچ هاوەڵو هاوبەشێکی بۆ دانەنرێت. جا باوەڕداران لە کام مەرجیان کۆتا هاتن نابێ چاوەڕوانی هاتنە دی ئەو بەڵێنەی ﷲ ببن.

(٥٦) جانوێژ بکەن، چونکە بەندایەتی خوای تاکو تەنهایەو میعراجی ئەم ئوممەتەیەو ڕێگای پەیوەندی ڕاستەو خۆی بەندەیە لەگەل پەروەردگاری تاکو تەنهای خۆیدا، خۆ زەکاتیش بدەن، بۆ پاك کردنەوەی خۆتان لە ڕەزیلیو ڕزگار کردنی براو خوشکانی نیازمەندی خۆتانو بلاو بونەوەی خۆشە ویستی لە نێوان چینی دەوڵەمەندو هەژاراندا‌و سەر ئەنجام بە دەست هێنانی ڕەزامەندی ئەو خوایەی کە ئەو سەروەتو سامانەی پێداون، دەی پەیرەوی ئەو پێغەمبەرەی خوا بکەن بەشکم ڕەحمتان پێبکرێت. بەڵێ بێگومان هەرکەسێك ئەوانە ئەنجام بدات ﷲ ڕەحمی پێدەکات وەك لەسورەتی تەوبەدا دەفەرموێ:﴿ئەوانە بەم زوانە ﷲ ڕەحمیان پێدەکات﴾.

نوێژو زەکات کە دوو بەشی بنەڕەتی ئیسلامن زۆر جار بە یەکەوە لە قورئاندا باسکراون، چونکە وەك وتمان یەکەمیان پەیوەندی بەندەیە بە خواوەو دووهەمیان پەیوەندی بەندەیە بە بەندەکانەوە جا ئەم دووانە بۆ ڕێكو پێككردنی ژیانی ئادەمیزاد زۆر پێویستو گرنگنو دەبێ هەروا بە گرنگی لەناو باوەڕداراندا بمێننەوە.

(٥٧) ئەی محمدﷺ بە هیچ جۆرێك واگومان مەکە کە ئەوانەی باوەڕیان نەهێناوەو دژایەتی تۆ دەکەن دەتوانن لەم زەویدا لەدەست ﷲ رابکەنو بە تۆڵەی تاوانەکانیان نەگەن، جا ئەوانە جێگایان ئاگری دۆزەخە بە ڕاستی ئەوەش سەرنویشتێکی خراپە بۆ ئەو تاوانبارانە، کافران هەرچەند بە هێزو بەدەسەڵاتبن بەڵام ناتوانن لەو زاتە ڕاکەن کە ئەو هێزو دەسەڵاتەی پێداون.جاخوا باسی چۆنیەتی شێوەی چونە ماڵەوەی ناوخۆی عائیلەکان دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٨) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە با ئەوانەی کە غوڵامو کەنیزەتانن‌و ئەوانەی کە هێشتا باڵغ نەبوون لە خۆتان بۆهاتنەژورەوە لە سێ کاتدا داوای ئیزن بکەنو هەروا خۆیان نەکەن بە ژوردا، چونکە هەم خۆتان ئارام نابنو هەم لەوانەیە ئەوانیش بە جۆرێك چاویان بە ئێوەدا هەڵتەقێ کە هەر دوولا توشی شەرمو تەریقی ببن، ئەو سێ کاتەش ئەمانەن یەکەم: لە پێش نوێژی بەیانیدا، دووهەم: کاتی نیوەڕۆ کە پۆشاکی زیادە لە خۆتان دەکەنەوە بۆ حەسانەوە، سێهەم: لە دوای نوێژی عیشادا ئەم سێ کاتە جێگای شەرمە بۆتانو پێویستە لەسەرتان کە پێش هاتنە ژورەوە بۆ لاتان ئیزن بخوازن، پاش ئەو سێ کاتە نە ئێوە ونە ئەوان تاوانتان لەسەر نیە کە بە بێ ئیزن بێن بە ناو یەکترداو هەندێکتان بە سەر هەندێکتاندا بچن، چونکە جگە لەو سێ کاتەدا ئەوانەی کە منداڵ نابالغو خزمەتکارو غوڵامو کەنیزەیان هەبێ زۆر بە ناویەکدا دێنو دەرۆن جا خاوەن ماڵیش نابێ بە شیوەیەك بێت کە ببێ بە هۆی شەرمەندەیی. خۆ هەر وەکو چۆن ئەو هاتوچۆیەی ناوخۆتانی بۆڕۆشنکردنەوە هەروەها ﷲ نیشانەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕۆشن دەکاتەوە، ئەوسا ﷲ زۆر زانایە بە هەموو کارو هەڵسوکەوتێکی ئێوەو زۆر دانایە لە دانانی بڕیارو فەرمانەکانیداو هیچ شتێکی بێسود نیە، ئەم دوو سیفەتە چەندین جار لەم سورەتەدا هاتوە، چونکە باسەکانی هەموی بڕیارو فەرمانی ﷲیە تا دڵنیا بین کە هیچ بڕیارێکی گۆترە کاری تێدا نیەو تا بە چاکی وەری بگرینو پەیرەوی

بکەین، جا هەر کەسێك باوەڕی بە عەلیمو حەکیمی اللَّهُ هەبێ دەبێ بە دڵوبە گیان فەرمانەکانی وەرگرێتو نەیانگۆڕێتەوە بە بڕیاری هیچ کەسێکیتر چونکە هیچ کەسێك نە بە ئەندازەی اللَّهُ زانایەو نە بە ئەندازەی ئەو دانایە، لادان لەوە گومڕاهیو نەفامیەو خۆ یەکسان کردنە لەگەڵ خوادا کە کوفرو خوانەناسیە.

(٥٩) جا هەر کاتێك ئەو منداڵانەتان باڵقبون، ئەوسا دەبێ وەك خەڵکە بێگانەکە کە لە پێشدا باسکران ئەمانیش لە هەمو کاتەکاندا بۆ هاتنە ژورەوە ئیزن بخوازن، هەر وەك ئەوەی چۆن رۆشنیکردوە هەر ئاوەها اللَّهُ نیشانەکانی خۆیتان بۆ رۆشن دەکاتەوە،خۆ اللَّهُ زۆر زاناودانایە.

(٦٠) جا ئەوانەی کە دانیشتونو دەرو ماڵ ناکەن لەو ژنانەی کە لەبەر پیری هیوایان نەماوە بە شوکردن ئەوانە ئەگەر پۆشاکی سەرەوەی خۆیان لابەن تاوانیان ناگات بەو مەرجەی کە بە خشڵەکانیان خۆیان نەڕازێننەوە، خۆ ئەگەر خۆیشیان داپۆشن ئەوە چاکترە بۆیان، چونکە وتراوە" بۆ هەمو کەوتویەك هەڵگرێك هەیە" لەوانەیە کەسێك هەبێت لەو تەمەنەی ئەودا حەزی بچێتە سەری لەبەر ئەوە خۆپاراستنەکەی چاکترە، جا اللَّهُ بیسەری هەمو قسەیەکە بە هەر شێوەیەك بکرێت، زۆر زانەریشە بە هەمو کاروکۆششێك.

(٦١) کوێرو شەلو نخۆش نە لەسەر وازهێنان لە جیهاد ونە لە تێکەڵاو بونیان لەکاتی خواردندا بە کەسانی ساغو سەلیم، وە نە لەچونیان بۆ خواردن بۆ ماڵی ئەوانەی کە باسیان دێت گوناهیان لەسەر نیە، ئەوسا هیچ گوناهێکتان لەسەر نیە کە لە ماڵی خۆتان - لە ماڵی کوڕانو کچانتان بخۆن چونکە پێغەمبەری خواﷺ لەوەڵامی کوڕێکدا کەوتی باوکم ماڵەکەی داگیر کردم فەرموی:{أَنتَ وَمَالُكَ لِأَبِيكَ وَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِنَّ أَوْلَادَكُمْ مِنْ أَطْيَبِ كَسْبِكُمْ فَكُلُوا مِنْ أَمْوَالِهِمْ /ابن ماجة وغ ه.صححه الألبا / خۆتو ماڵەکەشت موڵکی باوکتیو پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: بێگومان کە منداڵەکانتان لە پاکترینی کاسبیەکانتانە جالەماڵەکانیان بخۆن} یان خواردن - لە ماڵەکانی باوکانتان یان ماڵەکانی دایکانتان یان ماڵەکانی براکانتان یان ماڵەکانی خوشکانتان یان ماڵەکانی مامۆکانتان یان لە ماڵەکانی پورە کانتان (خوشکانی باوکی) یان لە ماڵەکانی خاڵۆکانتان یان لەماڵەکانی پورەکانتان (خوشکانی دایکی) یان ئەو ماڵەی کە کلیلی بە دەست ئێوەیە یان لە ماڵی دۆستو ناسیاوتان خواردن بخۆن هیچ تاوانێکتان لەسەر نیە. دیارە ئەمە وەختێکە کە بە رەزامەندی خۆیان بێت، هیچ تاوانێکتان لەسەر نیە کە ئەگەر بە یەکەوە بخۆن یان بە جیاجیا،

وَإِذَا بَلَغَ ٱلْأَطْفَٰلُ مِنكُمُ ٱلْحُلُمَ فَلْيَسْتَـْٔذِنُوا۟ كَمَا ٱسْتَـْٔذَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٩﴾ وَٱلْقَوَٰعِدُ مِنَ ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِى لَا يَرْجُونَ نِكَاحًا فَلَيْسَ عَلَيْهِنَّ جُنَاحٌ أَن يَضَعْنَ ثِيَابَهُنَّ غَيْرَ مُتَبَرِّجَٰتٍۭ بِزِينَةٍ ۖ وَأَن يَسْتَعْفِفْنَ خَيْرٌ لَّهُنَّ ۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٦٠﴾ لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ ءَابَآئِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَٰنِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَٰمِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّٰتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَٰلِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَٰلَٰتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُۥٓ أَوْ صَدِيقِكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَأْكُلُوا۟ جَمِيعًا أَوْ أَشْتَاتًا ۚ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةً طَيِّبَةً ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦١﴾

وە ئەمە رێ پێدانێکە ئەگینا بە یەکەوە خواردن چاکترە وەك پێغەمبەر دەفەرموێ: { كُلُوا جَمِيعًا وَلَا تَفَرَّقُوا ، فَإِنَّ الْبَرَكَةَ مَعَ الْجَمَاعَةِ /الديلمي، حسنه الالبا / پێکەوە بخۆنو جیاجیا مەبن بەراستی کە بەرەکەت لەگەڵ کۆدایە} ئینجا هەر کاتێ چونە ماڵی خۆتانەوە، یان ماڵێك کە کەسی تێدا نەبو سەلام بکەن لە خێزانومناڵتان سەلامێك کە لایەن خواوە فێرکراون کە مایەی فەرەو دڵخۆشکەرە. خۆ ئەگەر هیچکەسی تێدا نەبو بڵێ: (السَّلَامُ عَلَيْنَاو عَلَى عِبَادِ ا_ الصا / سەلام لە ئێمەو لە هەمو بەندە چاکەکانی خودا بێت) هەر ئاوەها چۆن ئەم بڕیارانەی رۆشنکردەوە هەر وایش اللَّهُ نیشانەکانی خۆیتان یەك لە دوای یەك بۆ رۆشندەکاتەوەو هەمو راستو ناراستیێکتان بۆ شی دەکاتەوە بەڵکو ئێوەیش فام بکەنەوەو راستی هەڵبژێرنو دوور بکەونەوە لە چەوتی.

(٦٢) باوەڕداران بە اللَّهُو بە پێغەمبەرەکەی تەنها ئەو کەسانەن کە هەر کاتێك لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بن لەسەر کارێکی کۆ کەرەوە وەك نوێژی جومعەو جەماعەتو غەزا ناچن بە هیچ لایەك دا هەتا داوای ئیزنی لێ نەکەن، بێگومان ئەوانەی کە داوای ئیزن لە تۆ دەکەن لەو کاتانەداو لە خۆیانەوە ناچن ئەوانە کەسانێکن کە باوەڕیان هەیە بە اللَّهُو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ، جا هەر کاتێ کە ئەوان داوای ئیزنیان لە تۆ کرد بۆ هەندێ کارو باریان تۆ خۆت سەرپشکی ئەوسا هەر کەس لەوان کە ئارەزۆت

إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَإِذَا كَانُوا۟ مَعَهُۥ عَلَىٰٓ أَمْرٍ جَامِعٍ لَّمْ يَذْهَبُوا۟ حَتَّىٰ يَسْتَـْٔذِنُوهُ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَـْٔذِنُونَكَ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ۚ فَإِذَا ٱسْتَـْٔذَنُوكَ لِبَعْضِ شَأْنِهِمْ فَأْذَن لِّمَن شِئْتَ مِنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمُ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٦٢﴾ لَّا تَجْعَلُوا۟ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيْنَكُمْ كَدُعَآءِ بَعْضِكُم بَعْضًا ۚ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمْ لِوَاذًا ۚ فَلْيَحْذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٦٣﴾ أَلَآ إِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قَدْ يَعْلَمُ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ وَيَوْمَ يُرْجَعُونَ إِلَيْهِ فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٦٤﴾

## ٢٥ سُورَةُ الفُرْقَانِ ٧٧

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَـٰلَمِينَ نَذِيرًا ﴿١﴾ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَخَلَقَ كُلَّ شَىْءٍ فَقَدَّرَهُۥ تَقْدِيرًا ﴿٢﴾

لێبو ئیزنی پێبده، وه له اللَّه داوای لێخۆشبونیشیان بۆ بکه. بێگومان اللَّه گوناح بەخشەو بێنیهایەت میهرەبانە بۆ بەندەکانی.

﴿٦٣﴾ بانگکردنی ئێوە بۆ پێغەمبەرﷺ وەك بانگکردنی هەندێکتان بۆ هەندێك نەبێ، واته: بەو جۆرە کە بانگ لە یەکتر دەکەن‌و ناوی یەکتر دەبەن بەو شێوەیە لە گەل پێغەمبەرداﷺرەفتار نەکەن، جا نابێ بانگی پێغەمبەریش ﷺ بۆ ئێوە وەك بانگی نێو خۆتان تەماشای بکەن چونکە وەڵام دانەوەی پێغەمبەرﷺ پێویستە، هەروەها نابێ دوعاو نزای پێغەمبەر ﷺ وەك نزای هەندێکتان لە هەندێکتان تەماشا بکرێت، چونکە پەروەردگار نزای پێغەمبەرﷺ وەری دەگرێ، بەراستی اللَّه ئاگای لەو کەسانەیە کە لەو کاتانە دا خۆیان دەدزنەوە، ئەوسا با ئەوانەی کە لە فەرمانی پێغەمبەرﷺ دەردەچن بترسن لەوەی کە توشی کوفرو شیرك ببن یان گرفتاری سزایەکی پڕ ئێش‌و ژان ببن، هەر وەك لە فەمودەدا هاتووه:{ مَنْ عَمِلَ عَمَلًا لَيْسَ عَلَيْهِ أَمْرُنَا فَهُوَ رَدٌّ/ متفق عليه/هەر کەسێك ئیشێك بکات کە فەرمانی ئێمەی لەسەر نەبێ ئەوسا ئەو ئیشەی بە سەردا دەدرێتەوەو لێی وەرناگیرێت} .

﴿٦٤﴾ ها بزانن کە بێگومان ئەوەی کە لەناو ئاسمانەکان‌و زەویدایە هەموی موڵکی اللَّهیە، بەراستی اللَّه بەو کردارو گوفتارو بەرنامەو هەڵوێستەی کە ئێوەی لەسەرە دەزانێ‌و لەو رۆژەدا کە بۆ حیسابو کیتاب دەگەڕێنرێنەوە بۆلای پێتان دەڵێت کە چیتان کردووەو پاداش یان سزای وەردەگرنەوە. خۆ اللَّه زانیاری بە سەر هەمو شتێکدا هەیە.

## ٢٥ سورەتی فورقان ٧٧

سورەتی فورقان سورەتی بیست‌و پێنجەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، حەفتاوحەوت ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چل‌ودووهەمەو پاش سورەتی (یس)و پێش (فاطر) دابەزیوە. وشەی(الفرقان) چوار جار لە قورئاندا هاتوە.

بەناوی اللَّه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ گەورەو بە فەڕو خاوەنی خەیری زۆرە ئەو کەسەی کە قورئانی ناردوەتە سەر بەندەکەی کە محمدەﷺ بۆ ئەوەی ترسێنەر بێ بۆ هەموجیهانیان.

﴿٢﴾ ئەو خوایەی کە هەر بۆ ئەوە موڵکێتی ئاسمانان‌و زەوی‌و کەسی بە منداڵ بۆ خۆی دانەناوەو لەو موڵکەیدا هیچ شەریکێکی نەبووە هەمو شتێکی دروستکردووە، جا ئەندازەیشی گرتوە بەئەندازە گیریەکی تێرو تەواوو هیچی بە گۆترەو بێ سەرو بەر دروست نەکردوە، بەڵکو ماوەی ژیانی‌و کاتی لەناوچونی دیاری کردووەو هیچ پاش‌و پێشێ لەودا نابێ

﴿٣﴾ ئەوان جگە لەاللَّه چەندین خوایان بۆ خۆیان داناوە کە هیچ شتێك دروست ناکەن بەڵکو ئەوان خۆیان دروستکراون‌و بۆ خۆشیان خاوەنی هیچ زیان‌و سودێك نین، خۆ نە مردن‌و نە ژیان‌و نە زیندو بونەوەیشیان بەدەست نیە، جا ئەوانە چاوەڕانی چ خەیرو بەیرێك لەو شتە بێ دەسەلاتانە دەکەن؟!

﴿٤﴾ جا ئەوانەی کە بێباوەربون وتیان: ئەمە هەر درۆیەکەو هەڵی بەستووەوە کەسانیتر لەسەر ئەو درۆو هەڵبەستنە یارمەتیان داوە، بەراستی ئەوانە لەم قسانەیاندا هەر ناهەقی‌و درۆیان کردووەوهیچ شتێکی راستیان بەدەستەوەنیە.

﴿٥﴾ دەڵێن: ئەم قورئانە ئەفسانە گەلێکی پێشوانەو داوا دەکات بۆی بنوسرێتەوە، جا بە بەیانیان‌و ئێواران بەسەریدا دەخوێنرێتەوە تا لەبەری بکات‌و پاشان بیخوێنێتەوە بۆ خەڵك.

﴿٦﴾ جا خوا دەمکوتیان دەکات‌و دەفەرموێ: بڵێ: وانیە کە ئێوە دەڵێن بەڵکو ئەم قورئانە ئەو زاتە ناردویەتی کە نهێنیەکانی ناو ئاسمانان‌و زەوی ئەزانێت، دەی با واز لەو قسە پڕوپوچانە

بهێنن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای ﷲ بێگومان کە ئەو زاتە تاوان بەخش‌و بەرەحمە.

﴿٧﴾ خۆ وتویشیانە: ئەمە چۆن نێردراوێکە کە خواردن دەخوات‌و بۆ بە دەست هێنانی بژێوی بە ناو بازاڕدا دەڕوات؟ دەبا بۆ لای ئەو فریشتەیەك ڕەوانە بکرایە ئەوسا لەگەڵ ئەودا ترسێنەر بووایا کە خەڵکیان بترساندایە تا باوەڕمان پێبکردایە. بەڵێ، کافرانە پێیان وایە پێغەمبەر دەبێ فریشتە بێ‌و نیازی بە خواردن‌و ئیشکردن نەبێت، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش لە مرۆڤ بێت لای کەم دەبوایە فریشتەیەکی لەگەڵ دا بوایە، بە یەقین ئەگەر وایش بوایە ئەیانوت ئەوە فریشتەیەو ئێمە چۆن وەکو ئەومان پێدەکرێت؟ بێباوەڕان لەبەر ناهەقی‌و ڕاکردن لە حەق‌و ڕاستی لەسەر چڵێك ناوەستن‌و وەك دوخەڕێسە هەر دەڕێسن‌و هەردەیلێنەوە:

﴿٨﴾ یان گەنجینەیەکی بۆ حەواڵە بکرایە تا دەوڵەمەند‌و بێنیاز بوایە یان باغێکی ببوایە کە لێی بخواردایە، جا ستەمکاران بە باوەڕدارانیان دەوت: ئێوە دوای پیاوێك کەوتون کە هەر جادوی لێکراوە، بەڵێ تاوانباران ئەو هەمو قسە پڕو پوچ‌و دەمە دڕێژییەی خۆیانیان بەلاوە جوانە، بەڵام ئەو قسە چاك‌و پڕ لە زانیاری‌و فەڕو خەیرەی پێغەمبەریان ﷺ بە لاوە جادوی جادوکەرانە؟! نخۆش ئاوی شیرینی لەلا تاڵە!

﴿٩﴾ ئینجا خوا دەفەرموێ: تەماشا بکە چ نمونەو وێنە گەلێکیان بۆ تۆ هێناوە! ئەوسا ئەوان سەریان لێ تێك چووەو حەق‌و ڕاستییان لێ ون بوە، جا ئیتر ناتوانن ڕێگایەك بدۆزنەوە بۆ ناسینی ڕاستی.

﴿١٠﴾ خاوەنی خەیری زۆرە ئەو زاتەی کە ئەگەر بیەوێ چاکتر لەوەی کە ئەوان دەیڵێن پێت دەدات کە باغاتێکت هەبێت‌چەندین جۆگەی بەناوادا بڕوات و چەندین کۆشکت پێدەدات، بەڕاستی ئەم تاوانبارانە لەم قسە پوچانەیان مەبەستیان ئەوە نەبو کە ڕاستیان بۆ دەرکەوێت،

﴿١١﴾ بەڵکو ئەوان باوەڕیان بە قیامەت نەبو، جا ئێمەش بۆ ئەو کەسەی کە باوەڕی نەهێنا بێ بە قیامەت ئاگری سوتێنەری دۆزەخمان بۆئامادە کردوە.

وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗ لَّا يَخۡلُقُونَ شَيۡـٔٗا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ وَلَا يَمۡلِكُونَ لِأَنفُسِهِمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا وَلَا يَمۡلِكُونَ مَوۡتٗا وَلَا حَيَوٰةٗ وَلَا نُشُورٗا ﴿٣﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٌ ٱفۡتَرَىٰهُ وَأَعَانَهُۥ عَلَيۡهِ قَوۡمٌ ءَاخَرُونَۖ فَقَدۡ جَآءُو ظُلۡمٗا وَزُورٗا ﴿٤﴾ وَقَالُوٓاْ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ٱكۡتَتَبَهَا فَهِيَ تُمۡلَىٰ عَلَيۡهِ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴿٥﴾ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٦﴾ وَقَالُواْ مَالِ هَٰذَا ٱلرَّسُولِ يَأۡكُلُ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشِي فِي ٱلۡأَسۡوَاقِ لَوۡلَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَلَكٞ فَيَكُونَ مَعَهُۥ نَذِيرًا ﴿٧﴾ أَوۡ يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡهِ كَنزٌ أَوۡ تَكُونُ لَهُۥ جَنَّةٞ يَأۡكُلُ مِنۡهَاۚ وَقَالَ ٱلظَّٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلٗا مَّسۡحُورًا ﴿٨﴾ ٱنظُرۡ كَيۡفَ ضَرَبُواْ لَكَ ٱلۡأَمۡثَٰلَ فَضَلُّواْ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ سَبِيلٗا ﴿٩﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِيٓ إِن شَآءَ جَعَلَ لَكَ خَيۡرٗا مِّن ذَٰلِكَ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَيَجۡعَل لَّكَ قُصُورَۢا ﴿١٠﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلسَّاعَةِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لِمَن كَذَّبَ بِٱلسَّاعَةِ سَعِيرًا ﴿١١﴾

﴿١٢﴾ ئەو ئاگرەی کە هەر کاتێ ئەو تاوانبارانە لە شوێنێکی دورەوە دییان گوێیان لە دەنگی توڕەیی‌و پینگ خواردنەوەیەتی لە داخی ئەو بێباوەڕانەو خەریکە پارچە پارچە ببێت.

﴿١٣﴾ خۆهەر کاتێکیش دەستو پێ بەستراو دەهاوێژرێنە جێگایەکی تەنگی ناو ئەو دۆزەخەوە، جا لەو کاتەدا بانگیان لێ‌بێ شەرم دەبێ ولەوێدا داوای لە ناوچون‌و مردن بۆخۆیان دەکەن.

﴿١٤﴾ ئەوسا لە لایەن فریشتەکانەوە پێیان دەوترێ: ئەمڕۆ هاواری یەك جار مردن مەکەن، دەردتان گرانترەو بارتان زۆر قورسە بەڵکو داوای مردنی زۆر بکەن! بەڵام نە وەڵامیان دەدرێتەوە ونە دەمرن تێیداو نە دەژین بە ژیانێکی ئاسودە، جا ئەو هاوارو دادەیشیان هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنێت.

﴿١٥﴾ ئایا ئەوە چاکە یان ئەو باغی هەتاهەتاییەی کە بەڵێن دراوە بۆ لە خوا ترسان‌و پارێزکاران؟ کە ئەوە بۆ پارێزکاران پاداش‌و ئایندەیانە،

﴿١٦﴾ هەرچییان بوێ لەوێدا بۆیان هەیە و بۆ هەمیشەیش دەمێننەوەو ئەوە بەڵێنێکە لە لایەن پەروەردگارتەوە کە لە لایەن بەندەکانیەوە داواکراو دەبێت، چونکە بەڵێنی خوایەو بەڵێنی خوایش ڕاستەو دێتەدی.

إِذَا رَأَتۡهُم مِّن مَّكَانِۭ بَعِيدٖ سَمِعُواْ لَهَا تَغَيُّظٗا وَزَفِيرٗا ﴿١٢﴾ وَإِذَآ أُلۡقُواْ مِنۡهَا مَكَانٗا ضَيِّقٗا مُّقَرَّنِينَ دَعَوۡاْ هُنَالِكَ ثُبُورٗا ﴿١٣﴾ لَّا تَدۡعُواْ ٱلۡيَوۡمَ ثُبُورٗا وَٰحِدٗا وَٱدۡعُواْ ثُبُورٗا كَثِيرٗا ﴿١٤﴾ قُلۡ أَذَٰلِكَ خَيۡرٌ أَمۡ جَنَّةُ ٱلۡخُلۡدِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۚ كَانَتۡ لَهُمۡ جَزَآءٗ وَمَصِيرٗا ﴿١٥﴾ لَّهُمۡ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ خَٰلِدِينَۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ وَعۡدٗا مَّسۡـُٔولٗا ﴿١٦﴾ وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَيَقُولُ ءَأَنتُمۡ أَضۡلَلۡتُمۡ عِبَادِي هَٰٓؤُلَآءِ أَمۡ هُمۡ ضَلُّواْ ٱلسَّبِيلَ ﴿١٧﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ مَا كَانَ يَنۢبَغِي لَنَآ أَن نَّتَّخِذَ مِن دُونِكَ مِنۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِن مَّتَّعۡتَهُمۡ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ نَسُواْ ٱلذِّكۡرَ وَكَانُواْ قَوۡمَۢا بُورٗا ﴿١٨﴾ فَقَدۡ كَذَّبُوكُم بِمَا تَقُولُونَ فَمَا تَسۡتَطِيعُونَ صَرۡفٗا وَلَا نَصۡرٗاۚ وَمَن يَظۡلِم مِّنكُمۡ نُذِقۡهُ عَذَابٗا كَبِيرٗا ﴿١٩﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا قَبۡلَكَ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ إِلَّآ إِنَّهُمۡ لَيَأۡكُلُونَ ٱلطَّعَامَ وَيَمۡشُونَ فِي ٱلۡأَسۡوَاقِۗ وَجَعَلۡنَا بَعۡضَكُمۡ لِبَعۡضٖ فِتۡنَةً أَتَصۡبِرُونَۗ وَكَانَ رَبُّكَ بَصِيرٗا ﴿٢٠﴾

(١٧) ئەو ڕۆژەی کە ﷲ ئەوانو ئەوانەش کە پەرستویانن جگە لە ﷲ کۆ دەکاتەوە، جا پێیان دەفەرموێ: ئایا ئێوە ئەو بەندانەی منتان گومڕا کردوە یان ئەوان هەر خۆیان لەو ڕێگە ڕاستە لایانداوە؟

(١٨) وتیان: پاکو بێگەردی بۆ تۆ، شتی وانابێو لەئێمە ناوەشێتەوە کە جگە لە تۆ هیچ دۆستێك بۆ خۆمان بگرین بەڵام تۆ گوزەرانت بۆ ئەوانو باو باپیرانیان ئەوەندە خۆش کردوە — کە بە مشە خواردیانو خواردیانەوە —تا یادی تۆیان لەبیر نەما، جا ئەوان گەلێکی فەوتاون.

(١٩) ئێنجا ﷲ بەو بێ باوەڕانە دەفەرموێ: بەڕاستی ئاوا ئەوان بە درۆتان دەخەنەوە کە خودایانی ئێوە بن، جا چی دەکەن خۆ نە توانای لادانی سزاتان هەیە ونە یارمەتیەکتان بۆ هەیە نە لە خۆتانەوە ونە لە خوا دەستکردەکانتانەوە، جا هەر کەسێك لە ئێوە ستەم بکات بە تاوانو هاوبەشی دانان، دەبێ چاك بزانن کە سزایەکی زۆر گەورەی پێ دەچەژین بە مانەوەی هەتاهەتای لە دۆزەخدا.

(٢٠) هیچ کەسێکمان نەناردوە لە پێش تۆدا لە پێغەمبەران مەگەر ئەوانیش هەروەك تۆ خواردنیان دەخواردو بە بازاڕانیشدا دەگەڕان، جا ئێمە هەندێ لەخۆتانمان کردوە بە هۆی تاقیکردنەوەی هەندێکی ترتان، ئایا خۆ ڕادەگرن لەسەر ئەو ئەزمونو تاقیکردنەوە تا پاداشتان وەرگرن یان خۆ ناگرن تا زیاتر داخوخەم بخۆن؟ ئەوسا خوای تۆ بینەری هەمو هەڵسو کەوتو کردارێکەو گەردیلەیەکیشی لێون نابێ.

(٢١) خۆ ئەوانەی کە هیوای گەیشتن بە ئێمەیان نیەو باوەڕیان بە دوا ڕۆژ نیە وتیان: دەبا فریشتەمان بۆبهاتایە؟ یان خوامان ببینایە ، بەڕاستی خۆیان زۆر بە زلزانیو نافرمانیان کرد بە نافرمانیەکی زۆر گەورە.

(٢٢) بەڵێ: بێباوەڕان بەشیك لە ڕەخنەکانیان نەهاتنی فریشتە بو، جا خوا دەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی کە ئەوان چاویان بە فریشتەکان دەکەوێت بارودۆخی تاوانباران لەو ڕۆژەدا جێگای کەیفپێهاتنو مژدە نیە، جا ئەمە چ لەکاتی سەرەمەرگدا بێ چ لە ناو گۆڕو پاشان کۆکردنەوەدا بێ لە هەمو کاتێکدا چاو پێکەوتنی فریشتە بۆ ئەوان هەر لۆمەو سەرزەنشتە بە پێچەوانەی باوەڕداران کە چاو پێ کەوتنی فریشتە دڵدانەوەو مژدە پێدانیانە بە بەهەشتو ڕەزامەندی خوای میهرەبان، جا دەڵێن: ئاوا بەو شێوەیە سزامان مەدەن، ئەشگونجێ قسەی فریشتەکان بێت واتە: ئەمڕۆ مژدەو قسەی خۆش بۆ ئێوە نیەو ئەبێ ئەوە بەشتان بێت.

(٢٣) خۆ ئەوەیش کە کردبویان لە کردار هیچ نرخێکمان بۆ دانەناو کردمان بە تۆزێکی با بردوو، چونکە مەرجەکانی وەرگەرتنی تێدا نەبوە. کرداری چاك لەپاش باوەڕبون کاتێك وەرئەگیرێ کە دوو مەرجی تێدا بێتە جێ،

**یەکەم:** پاڵفتەی لە هەر شتێك کە کردوە بەتاڵ بکاتەوە وەکو هەمو جۆرەکانی شیركو لاملی بۆ ئەنجامدانی،

**دووهەم:** پەیڕەویکردنی شەریعەت لەئەنجامدانی عیبادەتدا، جا نەمانی یەکێك لەم دوومەرجانە کردەوەی چاکی مرۆڤ هەڵ دەوەشێنێتەوە خۆ ئاشکرایشە لە لای بێباوەڕان هیچکامیان نیە.

(٢٤) خەڵکانی بەهەشتی لەو ڕۆژەدا باشترین جێگاو جوانترین شوێنی حەسانەوەی نیوەڕۆیان هەیە، بە هۆی کردارو ڕەفتارو گوفتاری چاکو شەرع پەسەندیان.

(٢٥) خۆ ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان بە هەور لەت دەبێو فریشتەکان بە ڕێکردن ڕێ دەکرێن بۆ سەر زەوی. جا ئەو فریشتانە گەمارۆی هەموخەڵك ئەدەن لەسەرای مەحشەرداو پەروەردگاری عالەمیش دێت بۆ حیسابی هەموان، ئەمە یەکێکە لە روداوە گرنگەکانی هاتنی پاشە ڕۆژ.

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ لَا يَرۡجُونَ لِقَآءَنَا لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ نَرَىٰ رَبَّنَاۗ لَقَدِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ وَعَتَوۡ عُتُوّٗا كَبِيرٗا ٢١ يَوۡمَ يَرَوۡنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ لَا بُشۡرَىٰ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُجۡرِمِينَ وَيَقُولُونَ حِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا ٢٢ وَقَدِمۡنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنۡ عَمَلٖ فَجَعَلۡنَٰهُ هَبَآءٗ مَّنثُورًا ٢٣ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ يَوۡمَئِذٍ خَيۡرٞ مُّسۡتَقَرّٗا وَأَحۡسَنُ مَقِيلٗا ٢٤ وَيَوۡمَ تَشَقَّقُ ٱلسَّمَآءُ بِٱلۡغَمَٰمِ وَنُزِّلَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ تَنزِيلًا ٢٥ ٱلۡمُلۡكُ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡحَقُّ لِلرَّحۡمَٰنِۚ وَكَانَ يَوۡمًا عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ عَسِيرٗا ٢٦ وَيَوۡمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيۡهِ يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي ٱتَّخَذۡتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلٗا ٢٧ يَٰوَيۡلَتَىٰ لَيۡتَنِي لَمۡ أَتَّخِذۡ فُلَانًا خَلِيلٗا ٢٨ لَّقَدۡ أَضَلَّنِي عَنِ ٱلذِّكۡرِ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَنِيۗ وَكَانَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لِلۡإِنسَٰنِ خَذُولٗا ٢٩ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ٣٠ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا مِّنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ هَادِيٗا وَنَصِيرٗا ٣١ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ٣٢﴾

(٢٦) ئەو رۆژە دەسەڵاتی راستەقینە هەر تایبەتی ﷲیە وکەس هیچی لە دەست نایەت هەتا خودا رێی پێنەدا، جا ئەو کاتە رۆژێکی زۆر تەنگە لەسەر کافران.

(٢٧) لەو رۆژەدا ستەمکار لەداخا قەپ ئەکات بە هەردوو دەستی خۆیدا و دەڵێت: خۆزگە بە رێگەی پێغەمبەردا ﷺبچومایە .

(٢٨) وای بۆ من خۆزگە فڵانم نەکردایە بە دۆستی خۆم.

(٢٩) بەراستی ئەو دۆستە شەیتان سیفەتە، منی لادا لە قورئان پاش ئەوەی کە هاتە لامو ئەم توانی تێیبگەمو پەیڕەوی بکەم. خۆ شەیتان هەمیشە لادەری مرۆڤە لە رێی راستو خواناسی. خۆ ئەم روداوە ئەوەندە راستە وەك ئەوە رویدابێو دەفەرموێ:

(٣٠) جا پێغەمبەریشﷺوتی: ئەی پەروەردگارم بە راستی ئەم گەلەی من وازیان لەم قورئانە هێنا، جا چ رۆژێك تەنگترە لەو رۆژەی کە پێغەمبەرﷺ ئاوا شایەتیەك بدات لە پێشگای خوادا؟ ئەی خەڵکینە بافریای خۆمان بکەوینو هەرچی زووترە با ئاشتەوایی لەگەڵ خواو پەیامەکەیدا بکەین، ئەگینا دڵنیا بن کە ئەو رۆژە دێتە پێشەوەو پەنجەی پەشیمانی دەگەزینو پێغەمبەر ﷺ لێمان عاجز دەبێو شەفاعەتمان بۆناکات.

ئینجا ﷲ دڵنەوایی پێغەمبەرمان ﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

(٣١) هەر وەکو بۆ تۆ دوژمنانێکی دڵرەقو سەرسەخت هەیە بۆ هەمو پێغەمبەرێکی پێش تۆیش دوژمنانێکمان لە تاوانباران بۆ داناوە کە بانگی خەڵك بکەن بۆ سەر لێشێواویو بێباوەڕی، جا تۆ نائومید مەبە چونکە پەروەردگارت بەسە بۆت کە رێ پیشاندەرو یارمەتی دەرت بێت.

(٣٢) جا ئەوانەی کە باوەڕیان نەهێنا بو وتیان: دەی با ئەم قورئانە بە یەکجار بهاتایە خوارەوە ـ وەك تەوراتو ئینجیلو زەبورو ئەوانیتریش، پەروەردگاریش دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ: ـ هەر ئاوەها بە گوێرەی پێویست رەوانەی ئەکەین بۆت تا دڵتی پێ سەقامگیر بکەین.

لە راستیدا ئەگەر قورئان یەکجار بهاتایە خوارەوە لەو ماوە دورو درێژەی ژیانی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرماندا ﷺ لەگەڵ بونی ئەو هەمو تەنگو چەڵەمەو سەختیەی پێغەمبەرﷺویارانیدا لەوانەبو زۆرجار نائومێدی رووی تێ بکردنایەو ترسی ئەوەیان بوایە کە خوا تورەو بێزارە لێیان بەڵام هاتنی بە بەش بەشیو بەگوێرەی پێویست زیاتر گەرمو گوڕی پێدەدانو دڵنیا دەبون کە خوا لەگەڵیاندایەو بە تەنها لە گۆڕەپانی بانگەوازیو خەباتو جیهاددا بەجێی نەهێشتون ـ ئەوە بو فەرموی: وا دەکەین تا دڵت سەقامگیر بکەینو باشت بۆ رۆشن دەکەینەوەو چاکت بۆ بەیان دەکەین.

(٣٣) جا ئەوان هیچ نمونەوپەند گەلێکت بۆ باس ناکەن بۆبەر پەرچدانەوەت خۆ ئێمە راستترت بۆ دێنینو جوانترت بۆ لێکدەدەینەوەو تێیان دەگەیەنین کە کام راستەو کام ناڕاست.

(٣٤) لەپاشان خوا باسی خراپی دوا رۆژی بێباوەڕان دەکاتو دەفەرموێ: ئەوانە لەسەردەمو چاوانیان بەرەو دۆزەخ پاڵ دەنرێن، ئەوانە خراپترین جێگایان هەیە، چونکە لەدنیادا لارترین رێگایان هەڵبژاردبو.

لە ئەنەسەوە هاتوە کە پیاوێك وتی : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێباوەڕان لە رۆژی قیامەتدا چۆن لەسەردەمو چاویان کۆ دەکرێنەوە؟ جا فەرموی: بێگومان ئەو کەسەی کە لەسەر هەر دووقاچی بردویەتی بە رێدا دەتوانێت رۆژی قیامەتیش بە سەردەمو چاویدا بیبات بەرێدا.

(٣٥) جاخوای باڵادەست هەڕەشە لە دوژمنانی ئایینو پێغەمبەرمان ﷺ دەکاتو دەیانترسێنێت لەو کارەساتانەی کە بۆ دوژمنانی پێغەمبەرانی پێشو بوە، جا لە موساوە دەست پێدەکاتو دەفەرموێ: بە راستی ئێمە پەڕاوماندا بە موساو هارونی برایشمان کرد بە وەزیری.

وَلَا يَأْتُونَكَ بِمَثَلٍ إِلَّا جِئْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَأَحْسَنَ تَفْسِيرًا ﴿٣٣﴾ ٱلَّذِينَ يُحْشَرُونَ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ أُو۟لَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٣٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَا مَعَهُۥٓ أَخَاهُ هَٰرُونَ وَزِيرًا ﴿٣٥﴾ فَقُلْنَا ٱذْهَبَآ إِلَى ٱلْقَوْمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا فَدَمَّرْنَٰهُمْ تَدْمِيرًا ﴿٣٦﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ لَّمَّا كَذَّبُوا۟ ٱلرُّسُلَ أَغْرَقْنَٰهُمْ وَجَعَلْنَٰهُمْ لِلنَّاسِ ءَايَةً ۖ وَأَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٣٧﴾ وَعَادًا وَثَمُودَا۟ وَأَصْحَٰبَ ٱلرَّسِّ وَقُرُونًۢا بَيْنَ ذَٰلِكَ كَثِيرًا ﴿٣٨﴾ وَكُلًّا ضَرَبْنَا لَهُ ٱلْأَمْثَٰلَ ۖ وَكُلًّا تَبَّرْنَا تَتْبِيرًا ﴿٣٩﴾ وَلَقَدْ أَتَوْا۟ عَلَى ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِىٓ أُمْطِرَتْ مَطَرَ ٱلسَّوْءِ ۚ أَفَلَمْ يَكُونُوا۟ يَرَوْنَهَا ۚ بَلْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ نُشُورًا ﴿٤٠﴾ وَإِذَا رَأَوْكَ إِن يَتَّخِذُونَكَ إِلَّا هُزُوًا أَهَٰذَا ٱلَّذِى بَعَثَ ٱللَّهُ رَسُولًا ﴿٤١﴾ إِن كَادَ لَيُضِلُّنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا لَوْلَآ أَن صَبَرْنَا عَلَيْهَا ۚ وَسَوْفَ يَعْلَمُونَ حِينَ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ مَنْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ أَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيْهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾

﴿٣٦﴾ جا پێمان وتن: بچن بۆ لای ئەو گەلەی کە بێباوەڕبون بە نیشانەکانی ئێمە، ئەوسا ئەوانیش چونو پەیامی ﷲ یان پێ گەیاندن بەڵام ئەوان زیاتر لەخوا پەرستی دوورکەوتنەوەو دژایەتی موساو هارونیان کرد، خۆ ئێمەیش لە ناومان بردن چۆن لەناوبردنێك.

﴿٣٧﴾ جا گەلی نوحیش کاتێ باوەڕیان نەکرد بە پێغەمبەران نوقمی ناو دەریامان کردنو کردومانن بە پەند بۆ ژێیر کردنی خەڵکی پاش ئەوان ـ گەلی نوح تەنها یەك پێغەمبەریان بووە کە نوحەو نۆسەدو پەنجا ساڵ لە ناویاندا ژیاوەو بەرە و ئایینو یەکخواپەرستی بانگی کردون بەڵام ئەوان بە گوێیان نەکردو خوا بە تۆفان ئەوانی خنکاندو نوحو پەیرەوانی رزگار کرد، بەڵام باوەڕ نەبون بە یەك پێغەمبەر باوەڕنەبوونە بە هەمو پێغەمبەران بۆیە لێرەدا فەرموی: بێباوەڕبون بە پێغەمبەران. جائەم سزاو تۆڵەیە تەنها بۆ یەکو دووگەل نیە بەڵکو ئامادەمان کردوە بۆ ستەمکاران سزایەکی بە ئازار.

﴿٣٨﴾ خۆ عادو سەمودو یارانی بیر و گەلانی زۆری تریش لەو نێوانە دا هەر بەو دەردەی ئەوان چون.(الرس)واتە بیر.

﴿٣٩﴾ بۆ هەمویان باسو رێنمایمان کرد، بەڵام ئەوان هیچکامیان لە هیچیان پەندیان وەرنەگرتو هەمویانمان لە ناو بردن چۆن لەناو بردنێك مەگەر هەر خۆیان بزانن چییان بەسەر هاتبێ.

﴿٤٠﴾ بە راستی ئەم گەلەی کە ئێستا دژایەتی تۆ ئەکەن ئەی محمد ﷺ رۆیشتوون بەناو ئەو دێهاتانەی کە رهێڵەی بارانی بەردیان بەسەرداباری – گەلی لوت- ئایا نەیانبینیون؟ نەخێر ئەوان وانازانن کە زیندو دەکرێنەوە.

﴿٤١﴾ خۆ هەر کاتێك کە تۆ دەبینن هەر گاڵتەت پێ ئەکەنو دەڵێن: ئەمەیە کە خوا کردویەتی بە پێغەمبەر؟!

﴿٤٢﴾خۆ ئەگەر ئێمە خۆگر نەبوینایە خەریك بو لە بەندایەتی خواکانمان لامان بدات، واتە: شانازی ئەکەن بە دژایەتی پێغەمبەر ﷺ و خۆگرتنیان لەسەر بت پەرستی بۆیە خوا هەڕەشەیان لێ ئەکاتو دەفەرموێ: بەم زوانە کاتێ کە سزایان دی ئەزانن کە کێ گومڕاو سەر لێتێکچوە.

﴿٤٣﴾ پێم بڵێ ئەو کەسەی کە ئارەزۆی خۆی کردوە بە خوای خۆیو هەرچی بە ئارەزۆی خۆی چاکو جوان بێت پەیڕەوی ئەکاتو هەرئەوە ئایینو ریبازێتیو پشت لە ئایینو رێبازی ئیسلام دەکات ئایا تۆ چاودێرو پاسەوانی ئەویت کە نەیەڵێت گومڕاو سەرلێشێواو بێت؟ واتە: کەسێك کە خوا بەدبەختو سەرلێشێواوی بکات نە بە تۆو نە بە هیچکەسی تر خۆشبەختو هیدایەت دراو نابێت تۆ تەنها رێنماییت لەسەرە.

﴿٤٤﴾ یان تۆ وا ئەزانیت کە زۆربەی ئەوان ئەبیسن یان تێدەگەن؟ نەخێر ئەوان هەر وەکو ئاژەڵ وان بەڵکو سەرلێشێواو نەزانترو لاڕێ ترن، چونکە ئەوئاژەڵە بۆچی دروستکراونو بەو شێوەیە لەم ژیانەدا ئەژین، بەڵام ئەم مرۆڤە لاڕێ بوانە نازانن بۆچیش دروستکراون، جا کەسێك کە هاتنی بۆ دنیای بە دەست خۆی نەبوەو لە دنیا دەرچونیشی بەدەست خۆی نیەو پاشان زیندوکردنەوەیشی بۆ حیسابو پاداشو سزا بەدەست خۆی نەبێت ئەی نابێ بیر بکاتەوەو بزانێ بۆچی دروستکراوە؟ ﷲ دەفەرموێ: جنۆکەو ئینسانم تەنها بۆ بەندایەتی دروستکردوە.

﴿٤٥﴾ئینجا ﷲ چەندین نیشانەی بوونو دەسەڵاتی خۆیمان بۆ باسدەکاتو دەفەرموێ: ئایا نەت دیوە کە پەروەردگارت چۆن سێبەری درێژ کردوەتەوە ئەگەر خۆی حەزی بکردایە رای دەوەستان، پاشان خۆرمان کردوەتە بەڵگە لەسەری خۆ ئەگەر خۆر نەبوایە سێبەر نەدەبینرا.

﴿٤٦﴾ پاشان هێواش هێواش ئەو سێبەرە لا دەبەین بەهۆی هەڵهاتنی خۆرەوە. لێرەدا پێنج بەڵگە لەسەر بونو دەسەڵاتی خۆی پیشان ئەدات کە ئەمە یەکێك بوو لەوانە.

أَمْ تَحْسَبُ أَنَّ أَكْثَرَهُمْ يَسْمَعُونَ أَوْ يَعْقِلُونَ ۚ إِنْ هُمْ إِلَّا كَالْأَنْعَامِ ۖ بَلْ هُمْ أَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٤٤﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَىٰ رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاءَ لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ﴿٤٥﴾ ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا ﴿٤٦﴾ وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاسًا وَالنَّوْمَ سُبَاتًا وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُورًا ﴿٤٧﴾ وَهُوَ الَّذِي أَرْسَلَ الرِّيَاحَ بُشْرًا بَيْنَ يَدَيْ رَحْمَتِهِ ۚ وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾ لِنُحْيِيَ بِهِ بَلْدَةً مَيْتًا وَنُسْقِيَهُ مِمَّا خَلَقْنَا أَنْعَامًا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرًا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ لِيَذَّكَّرُوا فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٥٠﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَبَعَثْنَا فِي كُلِّ قَرْيَةٍ نَذِيرًا ﴿٥١﴾ فَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَجَاهِدْهُمْ بِهِ جِهَادًا كَبِيرًا ﴿٥٢﴾ وَهُوَ الَّذِي مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ وَجَعَلَ بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَحْجُورًا ﴿٥٣﴾ وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاءِ بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا ۗ وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا ﴿٥٤﴾ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ مَا لَا يَنْفَعُهُمْ وَلَا يَضُرُّهُمْ ۗ وَكَانَ الْكَافِرُ عَلَىٰ رَبِّهِ ظَهِيرًا ﴿٥٥﴾

(٤٧) **دووهەمیان**: خۆ هەر ئەو زاتەیە کە شەوی بۆ کردون بە پۆشاکو ئەتان شارێتەوەو خەوی کردوە بە هۆی حەسانەوەتانو رۆژیشی کردوە بە کاتی هەستانەوەو بڵاوبونەوەتان بەزەویدا بۆپەیداکردنی بژێویتان.

(٤٨) بەڵگەی **سێهەم** دەفەرموێ: جا ﷲ ئەو زاتەیە کە بای وەکو مژدەدەرێك پێش بارانو رەوانە کردنی رەحمەتی خۆی ناردوە تا دڵخۆشتان بکات بە نزیك بونەوەی باران بارین، وە لەئاسمانەوە ئاوێکی پاکو خاوێنمان بۆ ناردون.

(٤٩) تا بەو ئاوە وڵاتی مردوی بێ گژو گیا زیندو بکەینەوەو ئەوەیش کە دروستمان کردوە لە ئاژەڵو خەڵکێکی زۆر ئاوی پێ بدەین.

(٥٠) بە راستی ئەم ئاوەشمان بە شێوەی جیاجیا بە هەندێ شوێن زۆرو بە هەندێ کەمو بە هەندێکیش هەر هیچ، جا بەشمان کرد لەناویاندا تا بیر بکەنەوەو توانایی و هێزی پەروەردگاریان بۆ دەرکەوێتو باوەڕی پێبکەن کەچی زۆربەی خەڵك هەر بێباوەڕییان دەوێت!

(٥١) ئەگەر حەزمان لێبوایە بۆ هەمو شارو دێهاتێك پێغەمبەرێکمان دەنارد کە بەرەو خواپەرستیو رێگای راست بانگیان بکات بەڵام ئێمە ئەی محمدﷺتەنها تۆمان هەڵبژاردوە بۆ هەمو خەڵك بۆ گەیاندنی ئەم قورئانە، هەر وەکو خۆی دەفەرموێ: {كَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ كَافَّةً/ البخاري/ هەر پێغەمبەرێك رەوانە کراوە بۆ گەلی خۆیو من بۆ هەمو خەڵك رەوانە کراوم}

(٥٢) جا تۆ گوێ مەدە قسەی کافرانو بەو شێوەی کە ئەو قورئانە داوا دەکات کۆششو جیهادێکی گەورەیان لەگەڵدا بکە تا ملکەچ دەبن بۆ فەرمانی ﷲ. جا ئەوەی کە بەڵگەیە لە سەر ئەو خەڵکە تەنها ئەم قورئانەیە کە فەرمودەکانی پێغەمبەریشﷺ ماناو رۆشنکەرەوەیەتی.

(٥٣) لە بەڵگەی **چوارەمیاندا** دەفەرموێت: خۆ ﷲ ئەو زاتەیە کە دوو دەریای بە یەك گەیاندوە، ئەمیان ئاوی زۆر شیرینوتینوشکێنە ئەمی تریان ئاوی زۆر سوێروتاڵە، جا لە نێوانیاندا لەمپەرێکی زۆر بەهێزی داناوە کە رێگرێکی زۆربتەوەو نایەڵێت تێکەڵاو ببنو ئەو لەمپەرو رێگرەیش ئێمە بە چاو نایبینینو رێگری هاتوچۆی کەشتیەکانیش ناکات بەڵام نایەڵێت ئەو دوو ئاوە تێکەڵ بن! دەی چ هێزێك دەتوانێت ئەوە ئیشە بکات جگە لە ﷲ؟ وە سودێکی ئەو سوێرییەش ئەوەیە کە نایەڵێت دەریاکان بۆگەن بکەنو هەوایش خۆشتر دەکات.

(٥٤) بەڵگەی **پێنجەم**: جا ﷲ ئەو زاتەیە کە لەو ئاوە کەمو بێهێزو بێنرخە مرۆڤی دروستکردوەو کردویەتی بە دوو بەشەوە، نێرو مێو لەو رێگاوە دووبارە خەڵك ئەگاتەوە بەیەك بە نەژادو بە ژنو ژنخوازی، خۆ پەروەردگارت زۆر بە توانایە، کەچی ئەوان سپڵەو خوانەناسن، نە لە هێزو دەسەڵاتی دەترسن، وە نەسوپاسی نیعمەتەکانی دەکەن.

(٥٥) جا ئەوان بەندایەتی دەکەن بۆ شتانێك جگە لە ﷲ کە نە سودیان پێدەداتو نە زیان، خۆ خوانەناس بۆ دژایەتی پەروەردگاری خۆی پشت قایمکەری یەکترن، بەڵام سەرئەنجام بەشیان تێکشکانو لەناو چوونە.

(٥٦) جا تۆمان تەنها بۆ ئەوە ناردوە کە مژدەدەر بیت بە بەهەشت لە پاشە رۆژداو سەرکەوتن لە دنیادا بۆ چاکەکارانو ترسێنەر بیت بۆ خوانەناسان بە دۆزەخ لە دوارۆژداو بەلەناوچونو نەمان لە دنیادا.

(٥٧) بڵێ: لەسەر گەیاندنی ئەم قورئانە بە ئێوە من داوای هیچتان لێناکەم جگە لەوەی کە کێ دەیەوێ با ئەم رێبازە بەرەو پەروەردگاری خۆی بگرێتە بەر، جا ئیتر با ماڵو دەسەڵاتی بە ویستو ئارەزۆی خۆی لەم رێگا بەنرخەدا ببەخشێت.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٥٦﴾ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍ إِلَّا مَن شَآءَ أَن يَتَّخِذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٥٧﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَسۡـَٔلۡ بِهِۦ خَبِيرٗا ﴿٥٩﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْۤ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ۩ ﴿٦٠﴾ تَبَارَكَ ٱلَّذِي جَعَلَ فِي ٱلسَّمَآءِ بُرُوجٗا وَجَعَلَ فِيهَا سِرَٰجٗا وَقَمَرٗا مُّنِيرٗا ﴿٦١﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي جَعَلَ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَ خِلۡفَةٗ لِّمَنۡ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوۡ أَرَادَ شُكُورٗا ﴿٦٢﴾ وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ﴿٦٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا ﴿٦٤﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ﴿٦٥﴾ إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٦٦﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ﴿٦٧﴾

(٥٨) جا تۆ پشت ببەستە بەو زاتە زیندوەی کە نامرێت، وەلەگەڵ سوپاس کردنیدا یادی ئەو بکە، خۆ بەسە کە ئەو زۆر بە ئاگایە لە گوناهی بەندەکانیو هیچی لێون نابێت.

(٥٩) ئەو زاتەی کە ئاسمانانو زەویو ئەوەی کە لە نێوانیاندایە لە شەش رۆژدا دروستکردوە، پاشان بەو شێوەی کە شایانی ئەو زاتەیە لەسەر تەختی فرمانڕەوای وەستاو ئیشەکانی جێبەجێ دەکاتوحەقو راستیەکان بڕیار دەدات، وەهەر ئەوە چاکترین جیاکەرەوە کە بە سۆزو میهرەبانە بۆ هەمو دروستکراوەکانی، جا ئەگەر تۆ ئەمە نازانیت دەی لەو کەسەی کە زۆر چاك دەزانێت بپرسە، واتە: لەم بارەوە تەنها لە ﷲ خۆی بپرسەو هەر ئەوەی کە ئەو بە تۆ دەڵێت راستە.

(٦٠) خۆ هەر کاتێك بەوان بوترێت سەرداەنەوێنو گەردنکەچبن بۆ رەحمان دەڵێن: رەحمان کێیە؟ ئایا سوجدە ببەینو گەردنکەچ بکەین بۆ ئەوەی کە تۆ پێمان دەڵێیت؟وە ئەم بانگ کردنە بۆ بەندایەتی بۆ رەحمان شتێکی لە ئەوان زیاد نەکرد جگە لە دور بونەوەیان لە حەقو راستی، ئەوان باوەڕیان بە وەسفی رەحمان نیە بۆﷲ ئەوە بو لە ئاشتەوایی حودەیبیەشدا رازی نەبون کە بنوسرێتو وتیان: ئێمە رەحمانو رەحیم ناناسین.

(٦١) بێگەردەو خاوەنی فەرو چاکەی زۆرە ئەو زاتەی کە لە ئاسماندا چەندین کۆشكو لە ناویدا چرایەکی گەرمو رۆشن کە خۆرەو مانگی روناك کەرەوەی داناوە، جا ئەو کۆشکانە بریتی بن لەو ئەستێرە گەورانە یان هەر کوشك بنو هێشتا زانیاری لە بارەیانەوە شتێکی نەزانی بێت دور نیە.

(٦٢) خۆهەر ئەو زاتەیە کە شەووڕۆژ دێنێت بە دوای یەکداو بە گوێرەی پێویستی مرۆڤ لە یەکێکیان کەمدەکاتەوەو دەیداتە دەم ئەویتریان کە گەورە ترین بەڵگەیە بۆ ئەو کەسەی کە دەیەوێت بیر بکاتەوە یان سوپاسی خوا بکات.

(٦٣) ئینجا پەروەردگاری جیهان هەندێ لە سیفەتە بەرزو بە نرخەکانی بەندە شایستەکانی خۆیمان بۆ باس ئەکاتو ئەفەرموێ: جا بەندە راستو چاکەکانی رەحمان ئەو کەسانەن کە بە ئارامیو بێفیز لە سەر زەویدا دەڕۆنو هەر کاتێك نەزانان قسەی خراپیان لەگەڵدا بکەن قسەی چاكو بێزیان دەڵێنو بە ناشیرینی وەڵامیان نادەنەوە، چونکە دڵی باوەڕداری راستەقینە پڕیەتی لە سۆزو خۆشەویستیو چاکەخوازیو " کاسەیش چی تێدا بێت هەر ئەوەی لێدەڕژێت".

(٦٤) جا ئەوانە کەسانێکن کە شەوان بۆ پەروەردگاریان لەسوجدەو لە وەستاندان.

(٦٥) وە ئەو کەسانەن کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لە سزای دۆزەخ لامان بدە کە بێگومان سزای ئەو ئەچەسپێت بە مرۆڤەوەو لێی جیا نابێتەوە.

(٦٦) بێگومان کە دۆزەخ خراپترین ئارامگاو جێگایە.

(٦٧) جا ئەوانە کەسانێکن هەر کاتێك شتیان بەخشی نە زیادەڕەوی دەکەنو نە رەزیلی بەڵکو مام ناوەندن لەو نێوانەدا.

(٦٨) وە بەندە چاکەکانی رەحمان ئەو کەسانەن کە لەگەڵ ﷲدا پەرەستراوێکی تر ناپەرستنو هاوارو پەنا بۆ هیچ شتێکیتر نابەن، جا ئەو گیانەیش کە خوا قەدەغەی کردوە لێیان نایکوژن، مەگەر لەسەر حەق. وەك ئەو کەسەی کە کەسێکی بە ناحەق کوشت بێ یان لە ئایین پاشگەز بوبێتەوە یان هاوسەری حەڵاڵی بوو بێتو زینا بکات کە ئەوە بەحەق دەکوژرێت، خۆ زینایش ناکەن. جا هەر کەسێك شتێك لەوانە ئەنجام بدات دەگات بە تۆڵەی تاوانی خۆی.

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە هاتوە کە وتویەتی: { سَأَلْتُ أَوْ سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَيُّ الذَّنْبِ عِنْدَ اللَّهِ أَكْبَرُ قَالَ أَنْ تَجْعَلَ لِلَّهِ نِدًّا وَهُوَ خَلَقَكَ قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ ثُمَّ أَنْ تَقْتُلَ وَلَدَكَ خَشْيَةَ أَنْ يَطْعَمَ مَعَكَ قُلْتُ ثُمَّ أَيٌّ قَالَ أَنْ تُزَانِيَ بِحَلِيلَةِ جَارِكَ قَالَ وَنَزَلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ تَصْدِيقًا لِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ ﴿ وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي

﴿حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَ﴾ /متفق عليه / لە پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیارم کرد یان پرسیاری لێکرا: کام گوناهە گەورەترە؟ فەرموی: ئەوەیە کە تۆ هاوبەش بۆ ﷲ دابنێیت لە کاتێکدا کە ئەو تۆی دروستکردوە، وتم: پاش ئەوە چیتر؟ فەرموی: ئەوەیە کە تۆ مندالّی خۆت بکوژیت لە ترسی ئەوەی کە خواردنت لەگەڵدا بخوات، وتم: پاش ئەوە چی تر؟ فەرموی: ئەوەیە کە زینا لەگەڵ ژنی دەراوسێکەتدا بکەیت، عەبدولّا وتی: جا بۆ دان پێدانان بۆ راستی ئەو فەرمودەیە ﷲ ئەم ئایەتەی دابەزاند﴿جا بەندە چاکەکانی رەحمان ئەو کەسانەن کە لەگەل ﷲدا پەرەستراوێکی تر ناپەرستن‌و هاوارو پەنا بۆ هیچ شتێکی تر نابەن، وە ئەو گیانەی کە خوا قەدەغەی کردوە لێیان نایکوژن مەگەر لەسەر حەق، وە زینا ناکەن﴾

(٦٩) لە رۆژی قیامەتیشدا سزای ئەوخراپەکارە چەند بەرانبەر دەکرێت‌و لە ناو ئەو سزایەدا بۆ هەمیشە بە بێ نرخی‌و سوکی دەمێنێتەوە. لە عەبدولّای کوڕی عەباسەوە بوخاری‌و موسلم هێناویانە کە خەڵکێکی موشریك خەڵکیان زۆر کوشتبوو زینایان کرد بو، پاشان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو وتیان: بە راستی ئەوەی کە تۆ دەیلێیت‌و بانگ دەکەیت بۆلای زۆر جوانە، ئای هەواڵت پێ بداینە کەئایا کەفارەتی ئەوەی کە کردومانە هەیە؟ جا ئەم ئایەتەو ئایەتی پەنجاوسێی سورەتی (زومەر) دابەزین.

(٧٠) بەڵێ هەر کەسێك یەکێك لەوسێ تاوانە گەورە ئەنجام بدات ئەوە سزایەتی کە وترا مەگەر پەشیمان ببێتەوەو کار بکات بە کار کردنێکی چاك جا ئەگەر وای کرد ﷲ خراپەکانی بۆ دەگۆڕێتەوە بە چاکە، ئەوەش لای خوا دور نیە چونکە ئەو زاتە زۆر لێبوردەو بە سۆزە بۆ بەندەکانی. پیغەمبەر ﷺ باسی پیاوێك دەکات کە ئاخر کەس لە ناو ئاگری دۆزەخ دەردەهێنریت‌و ئەخرێتە بەهەشتەوە، جا لە کاتی حیسابی کردەوەکانیدا ﷲدەفەرموێ: باسی تاوانە گەورەکانی مەکەن‌و تەنها پرسیاری بچوکەکانی لێ بکەن، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {فَيُقَالُ لَهُ عَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا يَوْمَ كَذَا وَكَذَا عَمِلْتَ كَذَا وَكَذَا فِي يَوْمِ كَذَا وَكَذَا قَالَ فَيُقَالُ لَهُ فَإِنَّ لَكَ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ حَسَنَةً قَالَ فَيَقُولُ يَا رَبِّ لَقَدْ عَمِلْتُ أَشْيَاءَ مَا أَرَاهَا هَا هُنَا قَالَ فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ/مسلم وغيره/ پێی دەوترێت : ئەو گوناهەو ئەو گوناهەت لە فلاّن‌و فلاّن روژدا کردوە، ئەو گوناهەو ئەو گوناهەت لە فلاّن‌و فلاّن روژدا کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺفەرموی: جا بێگومان پێی دەوترێت لە جیاتی هەمو خراپەیەکدا چاکەیەکت بۆ حیساب دەکرێت ئینجا کابرا دەڵێت: ئەی پەروەردگارم بەراستی گوناهانێکم کردوە کە لێرەدا نایان بینم، ئەبو زەڕ وتی:

وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ﴿٦٨﴾ يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ﴿٦٩﴾ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٧٠﴾ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابٗا ﴿٧١﴾ وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا ﴿٧٢﴾ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا ﴿٧٣﴾ وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا ﴿٧٥﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ﴿٧٦﴾ قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا ﴿٧٧﴾

سُورَةُ الشُّعَرَاءِ ٢٦ ٢٣٧

جا پێغەمبەرم ﷺ دی کە ئەوەندە پێکەنی تا دانە پیرۆزەکانی پێشوی دەر کەوتن}

بەڵێ پەروەردگار ئەوەندە لێبوردەو میهرەبانە تەنانەت هەندێ کەس لە وانەی کە نەك هەر تاوانەکانی بۆ گۆڕیون بەچاکە بەڵکو بەهۆی میهربانی ئەو زاتەوە تەماع دەیانگرێت‌و ئاوات دەخوازن کە گوناهی زۆرتریان بکردایە وەك لەم فەرمودەدا هاتوە: {لَيَتَمَنَّيَنَّ أقوامٌ لَو أَكْثَرُوا مِنَ السَّيِّئاتِ قَالُوامَ يارَسُولَ الله؟ قال الَّذين بَدَّلَ الله عَزَّ وَجَلَّ سَيِّئَاتِهِم حَسَناتٍ /السلسلة الصحيحة/بەراستی گەلانێك ئاوات دەخوازن کە گوناحی زۆریان بکردایە، وتیان: لەبەرچی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرموی: چونکە کەسانێکن کەخوای بە دەسەلاّتی بەشکۆ خراپەکانی بۆ گۆڕیون بە چاکە}

(٧١) جا هەر کەسێك پەشیمان بویەوە لە تاوان‌و ئیشی چاکی کرد بێگومان ئەوەیە کە دەگەرێتەوە بۆ لای ﷲ و پەشیمانیەکەی لێ وەردەگیرێت.

(٧٢) جا ئەوانە کەسانێکن کەشایەتی درۆ نادەن، خۆ هەر کاتێکیش بەلای شتێکی خراپدا برۆن زۆر بە بەرێزانە تێ دەپەڕن‌و خۆیان بەو شتە خراپانە ناشیرین‌و لەکەدار ناکەن.

(٧٣) خۆ ئەوانە کەسانێکن کە هەر کاتێ ئامۆژگاری کران بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان هەروا کەڕو کوێرانە بەسەریا تێناپەڕن، بەڵکو لێی ورد دەبنەوەو سودی لێوەر دەگرن.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طسم (١) تِلْكَ آيَاتُ الْكِتَابِ الْمُبِينِ (٢) لَعَلَّكَ بَاخِعٌ نَفْسَكَ أَلَّا يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ (٣) إِنْ نَشَأْ نُنَزِّلْ عَلَيْهِمْ مِنَ السَّمَاءِ آيَةً فَظَلَّتْ أَعْنَاقُهُمْ لَهَا خَاضِعِينَ (٤) وَمَا يَأْتِيهِمْ مِنْ ذِكْرٍ مِنَ الرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ إِلَّا كَانُوا عَنْهُ مُعْرِضِينَ (٥) فَقَدْ كَذَّبُوا فَسَيَأْتِيهِمْ أَنْبَاءُ مَا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ (٦) أَوَلَمْ يَرَوْا إِلَى الْأَرْضِ كَمْ أَنْبَتْنَا فِيهَا مِنْ كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ (٧) إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُمْ مُؤْمِنِينَ (٨) وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ (٩) وَإِذْ نَادَىٰ رَبُّكَ مُوسَىٰ أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ (١٠) قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلَا يَتَّقُونَ (١١) قَالَ رَبِّ إِنِّي أَخَافُ أَنْ يُكَذِّبُونِ (١٢) وَيَضِيقُ صَدْرِي وَلَا يَنْطَلِقُ لِسَانِي فَأَرْسِلْ إِلَىٰ هَارُونَ (١٣) وَلَهُمْ عَلَيَّ ذَنْبٌ فَأَخَافُ أَنْ يَقْتُلُونِ (١٤) قَالَ كَلَّا فَاذْهَبَا بِآيَاتِنَا إِنَّا مَعَكُمْ مُسْتَمِعُونَ (١٥) فَأْتِيَا فِرْعَوْنَ فَقُولَا إِنَّا رَسُولُ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦) أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ (١٧) قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ (١٨) وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ (١٩)

(٧٤) جا ئەوانەیشن کە دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان هاوسەرانو وەچەیەکمان پێ ببەخشە کە چاکو پاکو چاورۆشن کەرەوە بن بۆمانو وامان لێبکەیت کە بۆ پارێزکاران پێشەواو چاو لێکراو بین. بەڵێ، بەندە راستەکانی رەحمان پێیان خۆشە هاوسەرو وەچەو نەوەکانیشیان چاکو پاک بن تا پاداشتی گەورەتریان دەست بکەوێت ئەوەتە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ/ مسلم / هەر کاتێك مرۆڤـ مرد کرداری دوایی دێت مەگەر لە سێ رێگاوە **یەکەمیان**: چاکەیەك کە پاش خۆی بمێنێتەوە وەك مزگەوتو پردو بیرو نەخۆشخانە، **دووهەمیان**: زانیارییەك کە پاش خۆی سودی لێوەر بگیرێت. **سێهەمیان**: مندالی چاك کە دوعای بۆ بکات}

وە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئیمامەتو پێشەوایەتی شتێکی کەسبیە. وە مرۆڤ بە پارێزکاریو علیمو کۆشش بەگوێرەی شەریعەت دەگات بە پلەی ئیمامەتە بەڵام ئەگەر ئەمرێکی تەوفیقیو دیاریکراو لە لای اللَّه وە بوایە ئەم دوعایەیەی کە اللَّه وەسفی خاوەنەکەی دەکات بێماناو مەفهوم دەبێت کەئەمە بەڵگەیەکە لەسەر ئەو بۆچونە هەڵەو بێ سەروبەرەی کە ئیمامەت بە پلەیەکی گەورەتر لەپلەی پێغەمبەرایەتیو دیاری کراو بە بنەماڵەیکی تایبەت دەزانێو پێی وایە کە کەسی تر جگە لەوان ناگەیەت بەو پلەیەو ناتوانێت داوایشی بکاتو دەستکاری ئەم ئایەتەشیان کردوە وەك ئایەتەکانی تری ئەم قورئانە پیرۆزەو دەڵێن: ئایەتەکە گۆڕاوەو درۆیەك لە ئیمامی سادقەوە دەهێنن کە گوایە لەم بارەوە لەویان پرسیوە ئەویش وتویەتی: (قد سألوا الله عظيماً أن يَجعَلَهُم لِلمُتَقِينَ أَئِمَةً، فقيل له: كَيفَ هذا يا ابنَ رَسولِ الله؟ قال: إنما أَنزَلَ اللهُ "وَاجْعَلْ لَنَا مِنَ الْمُتَقِينَ إماماً" [تفسير القمي" سورة الفرقان] واتە: داوای شتێکی گەورە دەکەن لە اللَّه کە بیبیان کات بە ئیمام بۆ پارێزکاران، واتە: ئەم ئیمامەتە لەوە گەورەترە کە کەسێك بیبەوێت لە اللَّه دەوای ئەو پلەیە بکات وتیان: ئەی کوڕی پێغەمبەری خوا ئەی چۆن دابەزیوە، وتی: اللَّه تەنها بەم شێوەیە رەوانەی کردوە "لەناو پارێزکاراندا ئیمامێکمان بۆدا بنێ"!). ئینجا خوای گەورەو میهرەبان لە پاداشتی ئەو بەندە چاکانەی خۆیدا کە خاوەنی ئەو سیفەتانە بن دەفەرموێ:

(٧٥) ئەوانە بە هۆی خۆ راگرتنیان لەسەر ئەو رەوشتو سیفەتە جوانانەیان هۆدەکانی بەهەشتیان پێدەدرێتو لە ناویاندا لە لایەن پەروەردگاری جیهانیانو فریشتەکانەوە پێشوازیو سەلامیان لێ دەکرێت،

(٧٦) کە بۆ هەمیشە دەمێنێنەوە لە ناویدا، جوان ئارامگاو جێگایەکە ئەو بەهەشتە.

(٧٧) ئینجا اللَّه دەفەرموێ: ئەی محمدﷺپێیان بڵێ: ئەگەر لەبەر بەندایەتیتان نەبێت پەروەردگارم هیچ گوێتان پێ نادات، چونکە ئێوەی بۆ بەندایەتی دروستکردوە، جا بە راستی ئێوە ئەی بێباوەڕان ئەم پەیامو پێغەمبەرەتان بە درۆ خستەوەو دەستتان لە کوفرو تاوان هەڵنەگرت، بەم زوانە سزای ئەوتاوانانە دەچەسپێت پێتانەوەو لێتان جیانابێتەوە.

## سورەتی شوعەرا (٣٦) (٢٢٧)

سورەتی شوعەرا کە سورەتی بیستو شەشەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، دووسەدوبیستو حەوت ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چلو حەوتەمەو پاش سورەتی (الواقعة)و پێش (النمل) دابەزیوە. وشەی(الشعراء) یەکجار لە قورئاندا ئەویش لە ئایەتی دووسەدوبیستو چواری ئەم سورەتەدا هاتوە.

بەناوی اللَّه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) تا، سین، میم.

(٢) ئەمانە کە لەم سورەتەدا دێن بەڵگەکانی ئەم پەڕاوە رۆشنکەرەوەیە کە حەقو بەتاڵو چاکو خراپ لەیەك جیا

دەکاتەوە، بەڵام سەر لێشێواوو هەواو هەوەس پەرستان بەڕاستی نازانن‌و دژایەتی دەکەن، جا پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەمە زۆر خەمی دەخوارد، بۆیە پەروەردگاری میهرەبان دڵنەوایی دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٣﴾ بە خەمو پەژارە تۆ دەتەوێت خۆت بکوژیت لەسەر ئەوەی کە ئەوان باوەڕ بەم پەڕاوە ناکەن!

﴿٤﴾ ئەگەر ئێمە ئارەزۆمان لێ بێت لە ئاسمانەوە نیشانەیەکیان بۆ دەنێرین کە نەتوانن هیچ ملەجەڕەیەك بکەن، جا گەردنی بۆ کەچ بکەن، بەڵام ئێمە باوەڕی بە زۆرەملیمان ناوێت بەڵکو باوەڕێکمان دەوێت کە بە کەیفی خۆی هەڵیبژێرێت، جا تۆ خۆت ناڕەحەت مەکەو تەنها پەیامەکەت ڕابگەیەنە، ئێمە ئاگاداری ئەوانین‌و لەسەر هەڵوێستی ئەوان سەبارەت بەو پەیامە پاداشت‌و سزایان دەدەین. ئینجا ﷲباسی هەڵوێستی زۆربەی خەڵك بەرامبەر بەو پەیامە دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٥﴾ئەوان هەمیشە پشت دەکەنە هەموو قسەو باسێکی تازە کە لەلای ڕەحمانەوە بۆیان بێت.

﴿٦﴾بەڕاستی ئەوان باوەڕیان نەکرد بەم پەیامە، جا بەم زوانە پێیان دەگات هەواڵی ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد، واتە: ﷲ لە دنیادا دوچاری بەڵایان دەکات‌و لە قیامەتیشدا بە ئاگری دۆزەخ سزایان دەدات.

﴿٧﴾ لە پاشان ﷲ بۆ ئەوەی بیر بکەنەوەو دەست لە خوانەناسی هەڵگرن هەندێك لە بەڵگەی دەسەڵات‌و گەورەیی‌و توانایی خۆی باسدەکات‌و دەفەرموێ: ئایا خوا نەناسان تەماشای زەوی ناکەن کە ئەو هەمو گژوگیای جووتەو لەیەکچووانەمان تێیدا ڕوواندوە کە سوودو کەڵکی جوان‌و چاکیان لێ وەردەگرن؟

﴿٨﴾ بێگومان لەو هەمو گژوگیای ڕەنگاورەنگەو بە کەڵکانە بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ خاوەن هۆشان، بەڵام زۆربەی ئەوان باوەڕدارنین.

﴿٩﴾ بێگومان پەروەردگارت دەسەڵاتدارەو بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لەستەمکاران‌و بە بەزەیی ومیهرەبانە سەبارەت بە چاکەکارانی خوا ناس. ئەم دوو ئایەتە هەشت جار لەم سورەتەدا هاتوە. ئینجا هەر لەم سورەتەدا بەسەرهاتی حەوت پێغەمبەرمان کە لە موساوە دەست پێ دەکات بۆ باسدەکات‌و دەفەرموێ:

﴿١٠﴾ بۆ گەڵەکەت باس بکە وەبیریان بێنەوە ئەو کاتەی کە پەروەردگارت بانگی موسای کرد کە بچێت بۆ لای ئەو گەلە ستەمکارە.

﴿١١﴾ واتە:گەلی فیرعەون‌و پێیان بڵێ: ئایا ئێوە ناترسن لە ﷲ و واز لە تاوان‌و ستەم بهێنن‌و تەنها ﷲبپەرستن؟!

﴿١٢﴾ موسا وتی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من دەترسم بە درۆم بخەنەوەو باوەڕم پێ نەکەن.

﴿١٣﴾ جا منیش بەوە دڵم تەنگ ببێت‌و قسەم بۆ نەیەت، دەی ڕاسپێری بکە بۆ لای هارون، بۆ ئەوەی پشتیوان‌و یارمەتیدەرم بێت.

﴿١٤﴾ جا ئەوان ڕقێکی کۆنیان لە منەوە دەترسم لەسەرئەوە بمکوژن.

﴿١٥﴾ ﷲ فەرموی: نەخێر ئەوەیان پێ ناکرێت، جا هەردووکتان بە بەڵگەکانی ئێمەوە بڕۆن بۆ لای فیرعەون کە ئێمە بە یارمەتی‌و چاودێری لەگەڵتانین، بێگومان ئەوەی کە ئێوەو ئەوان دەیڵێن دەیبیسین.

﴿١٦﴾ هەردووکتان بچنە لای فیرعەون‌و پێی بڵێن: ئێمە فرستادەی پەروەردگاری جیهانیانین.

﴿١٧﴾ نەوەی ئیسرائیلمان لەگەل بخە. بەڵێ ئەمانیش هەردووکیان چوون‌و ئەم پەیامەیان گەیاندە فیرعەون.

﴿١٨﴾فیرعەونیش وتی: ئایا ئێمە تۆمان بەمنداڵی گەورە نەکرد، ئەوسا چەند ساڵی تەمەنیشت لەناو ئێمەدا مایتەوە؟

﴿١٩﴾ جا کردت ئەو کارەی کە کردت، کە پیاوێکی قیبتی لە دەست کوژرا کە "إن شاء الله" لە سورەتی قەصەص دا باسی دێت، وا دیارە کە تۆ ئەی موسا لە ڕیزی نمەك نەناسانی؟!

﴿٢٠﴾ موسا عليه السلام وتی: من ئەو کاتە ئەوەم کردو منیش لەریزی ڕێ لێ ونبواندا بووم.

﴿٢١﴾ ئەوسا منیش ئەو کاتە لە ترسی ئێوە ڕام کردو وڵاتم بەجێ هێشت، جا پاش دە ساڵ ئاوارەیی گەڕامەوە ئینجا ﷲ لە کێوی (تور) حوکم‌و دانایی پێبەخشیم‌و لەڕیزی ڕەوانەکراوانی خۆیدا دایانام.

﴿٢٢﴾جا ئایا ئەوە نیعمەتێکی وایە کە تۆ منەتی بخەیتە سەرم لە کاتێکدا کە تۆ نەوەی ئیسرائیلت کرد بو بە بەندەی خۆت‌و لە

قَالَ فَعَلۡتُهَآ إِذٗا وَأَنَا۠ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٢٠﴾ فَفَرَرۡتُ مِنكُمۡ لَمَّا خِفۡتُكُمۡ
فَوَهَبَ لِي رَبِّي حُكۡمٗا وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢١﴾ وَتِلۡكَ نِعۡمَةٞ تَمُنُّهَا
عَلَيَّ أَنۡ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴿٢٢﴾ قَالَ فِرۡعَوۡنُ وَمَا رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ
﴿٢٤﴾ قَالَ لِمَنۡ حَوۡلَهُۥٓ أَلَا تَسۡتَمِعُونَ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ
ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٢٦﴾ قَالَ إِنَّ رَسُولَكُمُ ٱلَّذِيٓ أُرۡسِلَ إِلَيۡكُمۡ لَمَجۡنُونٞ ﴿٢٧﴾
قَالَ رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَ
لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ
أَوَلَوۡ جِئۡتُكَ بِشَيۡءٖ مُّبِينٖ ﴿٣٠﴾ قَالَ فَأۡتِ بِهِۦٓ إِن كُنتَ مِنَ
ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣١﴾ فَأَلۡقَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِيَ ثُعۡبَانٞ مُّبِينٞ ﴿٣٢﴾ وَنَزَعَ يَدَهُۥ
فَإِذَا هِيَ بَيۡضَآءُ لِلنَّٰظِرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَ لِلۡمَلَإِ حَوۡلَهُۥٓ إِنَّ هَٰذَا لَسَٰحِرٌ
عَلِيمٞ ﴿٣٤﴾ يُرِيدُ أَن يُخۡرِجَكُم مِّنۡ أَرۡضِكُم بِسِحۡرِهِۦ فَمَاذَا
تَأۡمُرُونَ ﴿٣٥﴾ قَالُوٓاْ أَرۡجِهۡ وَأَخَاهُ وَٱبۡعَثۡ فِي ٱلۡمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ
﴿٣٦﴾ يَأۡتُوكَ بِكُلِّ سَحَّارٍ عَلِيمٖ ﴿٣٧﴾ فَجُمِعَ ٱلسَّحَرَةُ
لِمِيقَٰتِ يَوۡمٖ مَّعۡلُومٖ ﴿٣٨﴾ وَقِيلَ لِلنَّاسِ هَلۡ أَنتُم مُّجۡتَمِعُونَ ﴿٣٩﴾

ترسی تۆ من کەوتومەتە لای تۆ، جا ئەو چاکەیە لە بەرامبەر ئەو هەمو تاوانانەوە کە تۆ لەگەل نەوەی ئیسرائیلدا کردووتە چ نرخێکی هەیە؟!

﴿٢٣﴾ ئینجا فیرعەون کەوتە پرسیار کردن لە موساو وتی:کێ پەروەردگاری جیهانیانە؟ چونکە ئەو گەلەکەی خۆی وا حالی کرد بو کە جگە لەو خودایەکی تر نەناسنو تەنها بەندایەتی ئەوبکەن، جا هەر بە یەکەم قسەی موسا ئەو بە درۆ کەوتەوە، خۆ بەم پرسیارە مەبەستی ئەوەبو کە موسا بترسێو بلێ تۆیت، بەڵام موسا هەلگری پەیامی ﷲ یەو لە وتنی ڕاستی لە کەس ناترسێت.

﴿٢٤﴾ وتی پەروەردگاری جیهانیان ئەو زاتەیە کە ئاسمانانو زەویو ئەوەی کە لە نێوانیاندایە دروستی کردوە، ئەگەر ئێوە دلێکی سەلمێنەرو دیدێکی تیژتان هەبێت.

﴿٢٥﴾ جا فیرعەون بەوانەی کە لە چواردەوری بوون وتی: ئایا گوێ ناگرن بزانن چی دەلێت!

﴿٢٦﴾ جا موسا ﷺ درێژەی بە قسەکانی خۆی داو وتی: پەروەردگاری ئێوەو پەروەردگاری باو باپیرانتانە.

﴿٢٧﴾ فیرعەون وتی: ئەو پێغەمبەرەی کە نێرراوە بۆلاتان بێگومان شێتەونازانێ چی دەلێ.

﴿٢٨﴾ موسا ﷺ وتی: پەروەردگاری جیهانیان بەدیهێنەری ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاواو ئەوەی کە لە نێوانیاندایە ئەگەر ئێوە ژیریتان کار بکاتو نەزانانە بیرنەکەنەوە، خۆ ئەگەر فیرعەون ڕاست دەکاتو پەروەردگارە بائەوانە پێچەوانە بکاتەوە، جا فیرعەون کاتێ کەلە قسەدا شکستی خوارد، هەروەك نەریتی هەمو ستەمکارانی ملهوڕ کەوتە بەکارهێنانی زۆر تا بە باوەڕی خۆی بەو شێوە کاری موسا بە سوودی خۆی یەکسەرە بکاتەوە.

﴿٢٩﴾ فیرعەون وتی: ئەگەر جگە لە من خودایەکی تر بپەرستیت دڵنیا بە کە لەناو بەند کراوەکاندا خۆت دەبینیتەوە، واتە زیندانت دەکەم.

﴿٣٠﴾ موسا ﷺ وتی: ئایا هەر زیندانم دەکەیت ئەگەر لەسەر پێغەمبەرایەتیم بەلگەی ڕۆشنت بۆ بهێنم؟

﴿٣١﴾ فیرعەون وتی: ئەگەر تۆ لە ڕاستگۆیانیت دەی بیهێنە؟.

﴿٣٢﴾ جا موسا ﷺ عەساکەی فڕەدا گورج بو بە مارێکی ڕاستەقینە.

﴿٣٣﴾ خۆ دەستیشی لە باخەڵی دەرهێنا کەچی ئەویش بۆ تەماشا چیان زۆر سپی بوو نزیك بوو ئاوی چاویان ببات، بەڵام خوا نەناسی ستەمکار زۆر دوورە وابە زوویی خۆی بە دەستی حەقو ڕاستیەوە بدات، ئەوەتە فیرعەون لەجیاتی باوەڕهێنان دەستی دایە پیلانێکی تر بۆ گومان پەیداکردن لە پێغەمبەرایەتی موسادا.

﴿٣٤﴾ بە پیاو ماقوڵانی دەوروبەری خۆی وت: بەڕاستی ئەمە ساحیرێکی زۆرزانە.

﴿٣٥﴾ پاشان خۆی بە خەمخۆری ئەوان دادەنێتو دەلێت: موسا دەیەوێت کە لەم زەویەی خۆتاندا بەو سیحرەی دەرتان بکات، جا ئێوە لەمبارەوە بڕیارتان چییە؟ بەلێ تاغوتو ستەمکاران تا خۆیان ئیشیان بۆ بچێتە سەر پرس بە کەس ناکەن بەڵام کاتێك کەوتنە لێژیەوە، ئینجا پەنا بۆ دەوروبەریان دەبەنو پرسو ڕایان پێدەکەن کە گوایە ئێمە بڕیاری سەربەخۆ نادەینو بە پرسو ڕا ئیش دەکەین! تا کەمێك پێش ئێستا فیرعەون هەر خۆی خودا بوو کەسی تر مافی ڕا دەربڕینو ڕەخنە گرتنی نەبو وا ئێستا بەدەست موساوە داماوەو ناچار دەیەوێت بە جولاندنی ویژدان دەوروبەرەکەی بەگژ موسادا بکات.

﴿٣٦﴾ ئەوانیش وتیان: خۆیو براکەی لێرە گیر بدەو بۆ کۆکردنەوەی جادووگەران نوێنەر بنێرە بۆ هەمو شارەکان.

(٣٧) کە ئەوان هەرچی جادووگەری زۆر زانایە بۆت دەهێنن تا ئەوان بە گژیدا بچنو تۆ بە سەرکەوتویی بمێنیتەوە، جا فیرعەونیش بە قسەی کردنو خەڵکی نارد،

(٣٨) ئەوسا هەمو ساحیران کۆکرانەوە لەکاتی ڕۆژی دیاریکراودا.

(٣٩) جا بە خەڵکیش وترا: ئایا ئێوەش کۆدەبنەوە.

(٤٠) بەڵکو دوای جادووگەرەکان بکەوین ئەگەر ئەوان سەرکەوتن. بەڵێ خەڵکی هاتنو لە جێگاو ڕۆژی دیاریکراودا لەگەل هەمو جادوکەرانی زۆرلێزان دا کۆبونەوە.

(٤١) خۆ کاتێك جادوگەرەکان هاتن، بە فیرعەونیان وت: ئایا پاداشتێکمان هەیە ئەگەر ئێمە سەرکەوتین؟

(٤٢) وتی: بەڵێ پاداشتان هەیەو بێگومانیش ئەو کاتە ئێوە لەناو نزیکانی دەرباردا دەبن، واتە: خەلاتتان دەکەمو لە خۆمتان نزیك دەکەمەوە،

(٤٣) جا موساش ﷺ هاتو چاوی بە جادووگەران کەوت و پێی وتن: فڕێی بدەن،ئەوەی کە فڕەی دەدەن واتە: چیتان لەدەست دێت بیکەن بێ منەت بن.

(٤٤) جا ئەوانیش پەتو داردەستەکانیان فڕە داو وتیان سوێند بە گەورەیی فیرعەون: هەر ئێمە سەردەکەوین. جا ئەو جێگایە هەموی لەبەر چاوی خەڵك پڕ بوو لە ماری جۆراو جۆرو هەمویشیان دەجولان، تەنانەت موسا ترسی ئەوەی بۆ پەیدا بو کە ئەگەر لەلایەن خوداوە وەلام نەدرێتەوە چی بکات، بەلام پەروەردگار هات بە هانایەوەو فەرموی: موسا داردەستە کەت فڕێ بدە.

(٤٥) جا موسایش ﷺ دار دەستەکەی فڕێ دا، ئەوسا ئەویش ئەوەی کە ئەو جادووگەرانە کردبویان هەموی هەڵلوشیو گۆڕەپانەکەی خاوێنکردەوە لەو شتە پڕوپوچان جا جادووگەران زانیان بەڕاستی ئەوەی موسا جادوو نیە، چونکە ئەوان چاك سیحرو جادوویان دەناسیو باش شارەزای سیحر بون،

(٤٦) بۆیە هەمویان سەری گەورەیو ڕێزیان بۆ موسا نزم کرد.

(٤٧) وتیان: وا ئێمە بە پەروەردگاری جیهانیان باوەڕمان هێنا.

(٤٨) کە پەروەردگاری موساو هارونە، ئینجا تەختی خوایەتی فیرعەون کەوتە مەترسیەوە بۆیە کەوتە هەڕەشەو گوڕەشەکردن لەوجادوگەرانەی کە پشتی پێبەستبون.

لَعَلَّنَا نَتَّبِعُ ٱلسَّحَرَةَ إِن كَانُواْ هُمُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤٠﴾ فَلَمَّا جَآءَ ٱلسَّحَرَةُ قَالُواْ لِفِرْعَوْنَ أَئِنَّ لَنَا لَأَجْرًا إِن كُنَّا نَحْنُ ٱلْغَٰلِبِينَ ﴿٤١﴾ قَالَ نَعَمْ وَإِنَّكُمْ إِذًا لَّمِنَ ٱلْمُقَرَّبِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰٓ أَلْقُواْ مَآ أَنتُم مُّلْقُونَ ﴿٤٣﴾ فَأَلْقَوْاْ حِبَالَهُمْ وَعِصِيَّهُمْ وَقَالُواْ بِعِزَّةِ فِرْعَوْنَ إِنَّا لَنَحْنُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿٤٤﴾ فَأَلْقَىٰ مُوسَىٰ عَصَاهُ فَإِذَا هِىَ تَلْقَفُ مَا يَأْفِكُونَ ﴿٤٥﴾ فَأُلْقِىَ ٱلسَّحَرَةُ سَٰجِدِينَ ﴿٤٦﴾ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ رَبِّ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿٤٨﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ لَكُمْ ۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِى عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَ فَلَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ۚ لَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٤٩﴾ قَالُواْ لَا ضَيْرَ ۖ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا مُنقَلِبُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّا نَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لَنَا رَبُّنَا خَطَٰيَٰنَآ أَن كُنَّآ أَوَّلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٥١﴾ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾

(٤٩) فیرعەون وتی: پێش ئەوەی کە من ماوەتان پێبدەم باوەڕتان پێکرد؟ بێگومان ئەوە ئەو گەورەیەتانە کە ئێوەی فێری جادو کردبوو، بۆیە وا ئەمڕۆ لە قسەی دەرنەچوون جا بەم زوانە دەزانن چیتان بەسەردێت. دەستو قاچتان بە پێچەوانەی یەکتر دەبڕمو هەموتان بە داردا هەڵدەوەسم، بەلام ئەو جادووگەرانەی کەچەند کاتژمێر پێش ئێستا گەورەترین پاداشتیان نزیك بونەوە بو لە فیرعەون وا ئێستا ڕوناکی ئیمان چووەتە ناو دڵیانەوە، جا نەك نزیکی لە فیرعەون بەڵکو کوشتنو دورکەوتنەوەیان لە فیرعەون بە چاکترین خەلات دەزانن.

(٥٠) وتیان: بێ منەت بە، هەرچی دەکەیت بیکە ئێمە بۆ لای پەروەردگاری خۆمان دەگەڕێینەوە.

(٥١) بێگومان ئێمە هیوامان وایە کە پەروەردگارمان لەو تاوانانەی کە کردومانەو لەو جادوانەی کە تۆ زۆرت لێ کردوین چاوپۆشی بکاتو لێمان ببورێت، چونکە ئێمە یەکەم باوەڕدارین لە ناو گەلی خۆماندا. جا تەماشا بکەن باوەڕی ڕاستو دروست چەندە مرۆڤ ئازاو چاو نەترس دەکات پێشەکی چونکە خوانەناسبون چۆن لە فیرعەون دەترسانو لە فەرمانی دەر نەدەچوون بەلام وا ئێستا کەباوەڕیان هێنا بە اللہ و دانیان ناوە، بەڕاستی پێغەمبەرایەتی موسادا ﷺ، هیچ باکیان لە فیرعەون نیەو بێترسانە ڕوبەڕوی وەستاونو بێ منەتیشی دەکەن لە

فَلَمَّا تَرَآءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ وَٱتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٦٩﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٧٠﴾ قَالُوا۟ نَعْبُدُ أَصْنَامًا فَنَظَلُّ لَهَا عَٰكِفِينَ ﴿٧١﴾ قَالَ هَلْ يَسْمَعُونَكُمْ إِذْ تَدْعُونَ ﴿٧٢﴾ أَوْ يَنفَعُونَكُمْ أَوْ يَضُرُّونَ ﴿٧٣﴾ قَالُوا۟ بَلْ وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا كَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٧٤﴾ قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ﴿٧٥﴾ أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ﴿٧٦﴾ فَإِنَّهُمْ عَدُوٌّ لِّىٓ إِلَّا رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٧﴾ ٱلَّذِى خَلَقَنِى فَهُوَ يَهْدِينِ ﴿٧٨﴾ وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴿٨١﴾ وَٱلَّذِىٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِى خَطِيٓـَٔتِى يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٨٢﴾ رَبِّ هَبْ لِى حُكْمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٣﴾

هەرچی کە دژیان بیکات، ئینجا پاش ئەوەی کە موسا چەندین ساڵ لە میسردا پەیامی بەو خەڵکە گەیاند بەڵام ئەوان هەر زیاتر دژایەتیان دەکرد، ئەوسا پەروەردگار فەرموی:

﴿٥٢﴾ بە موسامان ڕاگەیاند کە شەو بەندە باوەڕدارەکانم ببە بەرەو ئەو جێگایەی کە بۆت دیاری کراوە، بێگومان فیرعەون و سوپاکەی بە شوێن ئێوەدا دێن.

﴿٥٣﴾ جا موسا عليه السلام و گەلەکەی بە فەرمانی الله ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە سەر دەریای نیل، ئەوسا فیرعەونیش کەسانێکی نارد بۆ شارەکان بۆ کۆکردنەوەی هێزی چەکدار، بۆ لەناو بردنی موساو پەیڕەوانی، جابە خەڵکیش بڵێن:

﴿٥٤﴾ بێگومان ئەوانە تاقمێکی کەمن. بەم قسەیە دەیەوێ نەترسن بەڵکوسوپایەکی زۆری بۆکۆبێتەوە ، بۆیە دەڵێ:

﴿٥٥﴾ بێگومان رقی ئێمەیان هەڵساندوەوتوڕەیانکردوین.

﴿٥٦﴾ بێگومان ئێمە هەمومان وریاو ئامادە باشین و نابێت لەوە زیاتر ماوەیان پێبدرێت و دەبێت لە ریشەیان بهێنین، بەڵام پەروەردگاری جیهانیان بە پێچەوانەی مەبەستی ئەوانی کردو ئەوەندە جووڵان تا سەری خۆیانیان تێدابرد، هەروەك دەفەرموێ:

﴿٥٧﴾ جا ئێمە ئەوانمان لەناو باخچەو چاوگەکاندا دەرکرد.

﴿٥٨﴾ خۆ خەزێنەکان و جێگا چاکەکانیشمان پێ بەجێ هێشتن.

﴿٥٩﴾ هەرئاوەها لەوانمان سەندەوەو دامان بە نەوەی ئیسرائیل،

﴿٦٠﴾ جا فیرعەون و پەیڕەوانی هەر لەگەل دەرکەوتنی ڕۆژدا دوای موساو پەیڕەوانی کەوتن و ڕۆیشتن تا گەیشتن پێیان.

﴿٦١﴾ جا کاتێك هەردوو تاقم چاویان بەیەك کەوت پەیڕەوانی موسا وتیان: بەڕاستی پێمان گەیشتن و خراپمان لێ قەوما.

﴿٦٢﴾ موسا عليه السلام وتی: وانیەو گومانی خراپ مەبەن بەڕاستی من پەروەردگارم لەگەلدایەو بەم زووانە ڕێنمایم دەکات کە چی بکەم.

﴿٦٣﴾ جا بە موسامان ڕاگەیاند کە عەساکەی لەو دەریایە بدات، موسایش عەساکەی لێداو دەریا لەتبوو بوبە دوانزە بەشەوە هەر بەشێکی وەکو چیایەکی گەورە وابوو، پەروەردگار زۆر بە زوویی قوڕی سەر ڕێی ئەوانی وا بتەو کردەوە کە موساو پەیڕەوانی بەئاسانی بە سەریدا تێبپەڕن.

﴿٦٤﴾ جا لەوێدا ئەوانی ترمان لەودەریایە نزیك کردەوە.

﴿٦٥﴾ ئەوسا موسا عليه السلام و ئەوانەی لەگەلیدا بون هەموویانمان ڕزگار کردو لەو دەریایە پەڕینەوە.

﴿٦٦﴾ لە پاشان ئەوانی ترمان خنکاند، واتە: فیرعەون و پەیڕەوانی هەموویان لەو دەریایەدا بن ئاو بوون، پاشان الله بۆ پەند وەرگرتن فیرعەونی خستە سەر دەریاو لاشەکەی وەکو خۆی هێشتەوەو تا ئێستایش هەر ماوە. بەڕاستی جیابونەوەی ئەو ئاوەو وەستانی وەك چیا گەورەکان و وشك کردنەوەی نێوانیان و ڕزگاربونی موساو پەیڕەوانی و خنکانی فیرعەون و پەیڕەوانی بۆ پەند وەرگرتن ڕووداوێکی زۆر گەورەو گرنگە بۆیە الله دەفەرموێ:

﴿٦٧﴾ بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ باوەڕ هێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

﴿٦٨﴾ خۆ بەڕاستی پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە خوانەناسان و زۆر بەسۆزە بەرامبەر باوەڕداران. هەروەکو بینیمان فیرعەون و پەیڕەوانی خوانەناسی چۆن خنکاندو موساو پەیڕەوانی چۆن ڕزگار کرد. جا دێتە سەر باسی ئیبراهیم عليه السلام دەفەرموێ:

﴿٦٩﴾ دەی هەواڵی ئیبراهیمشیان بۆ بخوێنەرەوە.

﴿٧٠﴾ ئەو کاتەی کە بە باوکی و بە گەلەکەی وت: ئەمە چیە کە ئێوە دەیپەرستن؟

(٧٠) وتیان: ئەمە بت گەلێکن کە دەیانپەرستینو بە قسەی کەسیش وازیان لێ ناهێنینو هەروەها دەمێنینەوە لەسەر بەندایەتی بۆکردنیان. جا ئیبراهیم دەیەوێت بە بەڵگە بۆیان بسەلێنێت کە ئەو بتانە هیچ نینو ئەوان لەسەر هەڵەن.

(٧٢) ئیبراهیم ﷺ وتی: ئایا هەر کاتێك بانگیان بکەنوهانایان بۆ ببەن ئەوان ئەو بانگەی ئێوە دەبیسنودێن بەدەمتانەوە؟

(٧٣) نەخێر پێم بڵێن، ئەگەر بەندایەتیان بۆ بکەن هیچ سوودێکتان پێ دەگەیەنن؟ یان ئەگەر دژایەتیان بکەن هیچ زیانێکتان لێ دەدەن؟ ئاشکرایە بۆ ئەم سێ پرسیارە هیچ وەڵامێکی ژیرانەیان نەبوە بۆیە،

(٧٤) وتیان: نەخێر، تەنها ئەوەیە کە باو باپیرانمان کاتی خۆی هەر ئاوەهایان دەکرد، جا ئیبراهیم بەهانەی بۆ خۆشبو،

(٧٥) وتی: پێم بڵێن ئەوە چیە کە دەیپەرستن؟

(٧٦) خۆتانو باو باپیرانی پێشووتان؟

(٧٧) ئەوسا هەمو ئەوانەی کەدەیانپەرستن دوژمنی منن جگە لە پەروەردگاری جیهانیان.

(٧٨) ئەو زاتەی کە منی درستکردوە، خۆ هەر خۆیشێتی ڕێنمایم دەکات.

(٧٩) جا ئەو زاتەی کە هەرخۆی خواردنو خواردنەوەم پێدەدات.

(٨٠) خۆ هەر کاتێکیش نخۆش بکەوم هەرخۆیەتی چاکم دەکاتەوە.واتە شیفا هەر لای خودایە نەکەسی تر.

(٨١) جا ئەو هەرخۆیشیەتی کە دەم مرێنیو زیندویشم دەکاتەوە، واتە: مەرگو ژیانم هەر بەدەست ئەوە.

(٨٢) وە هەر ئەوە کە هیوام پێی هەیە لە پاشە ڕۆژدا چاوپۆشی لە تاوانەکانم بکات. ئینجا ئیبراهیم دەست بە نزاو پاڕانەوە دەکاتو دەڵێ:

(٨٣) ئەی پەروەردگارم دانایيم پێببەخشەو بمخەرە ریزی پیاو چاکانەوە.

(٨٤) جا وام بۆ بکەیت کە لەناو خەڵکانی دوایشدا ناوم بە چاك ببرێت.

(٨٥) خۆ بمکە بە بەشبەری باخچەی پڕ لە خۆشی بەهەشتیش، واتە: لە دنیادا ناوی خۆشم هەبێتو لە دوارۆژیشدا بمخەرە بەهەشتەوە.

وَٱجۡعَل لِّي لِسَانَ صِدۡقٖ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٨٤﴾ وَٱجۡعَلۡنِي مِن وَرَثَةِ جَنَّةِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨٥﴾ وَٱغۡفِرۡ لِأَبِيٓ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا تُخۡزِنِي يَوۡمَ يُبۡعَثُونَ ﴿٨٧﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ مَالٞ وَلَا بَنُونَ ﴿٨٨﴾ إِلَّا مَنۡ أَتَى ٱللَّهَ بِقَلۡبٖ سَلِيمٖ ﴿٨٩﴾ وَأُزۡلِفَتِ ٱلۡجَنَّةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِلۡغَاوِينَ ﴿٩١﴾ وَقِيلَ لَهُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡبُدُونَ ﴿٩٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ هَلۡ يَنصُرُونَكُمۡ أَوۡ يَنتَصِرُونَ ﴿٩٣﴾ فَكُبۡكِبُواْ فِيهَا هُمۡ وَٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٩٤﴾ وَجُنُودُ إِبۡلِيسَ أَجۡمَعُونَ ﴿٩٥﴾ قَالُواْ وَهُمۡ فِيهَا يَخۡتَصِمُونَ ﴿٩٦﴾ تَٱللَّهِ إِن كُنَّا لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٩٧﴾ إِذۡ نُسَوِّيكُم بِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩٨﴾ وَمَآ أَضَلَّنَآ إِلَّا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٩٩﴾ فَمَا لَنَا مِن شَٰفِعِينَ ﴿١٠٠﴾ وَلَا صَدِيقٍ حَمِيمٖ ﴿١٠١﴾ فَلَوۡ أَنَّ لَنَا كَرَّةٗ فَنَكُونَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٠٢﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٠٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٤﴾ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ نُوحٍ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٠٥﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾ ۞ قَالُوٓاْ أَنُؤۡمِنُ لَكَ وَٱتَّبَعَكَ ٱلۡأَرۡذَلُونَ ﴿١١١﴾

(٨٦) جا لە باوکم خۆش ببە بەڕاستی ئەو لە لاڕێیانە. ئەم پاڕانەوانەی ئیبراهیمە ﷺ بۆ باوکی لەسەر بەڵێنێك بو کە پێیدابو بەڵام کاتێك کە زانی کە باوەڕ ناهێنێت ئیتر دوعای بۆ نەکرد کە ئەمە لە سورەتی تەوبەدا ڕۆشن کراوەتەوە.

(٨٧) وە لەو ڕۆژەی کە خەڵك زیندو دەکرێنەوە شەرمەندەم مەکە.

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {يَلقَى إبراهيمُ أَبَاهُ، فَيَقُولُ يَارَبِّ، إنَّكَ وَعَدتَنِي أن لا تُخزِنِي يومَ يُبعَثُونَ، فَيَقول الله، إنّي حَرَّمتُ الجَنَّةَ عَلَى الكَافِرِين/البخاري/ ئیبراهیم ﷺ لە ڕۆژی دواییدا دەگات بە باوکیو دەزانێت کە دۆزەخیە بۆیە دەفەرموێ: ئەی پەروەردگارم، بەڕاستی تۆ بەڵێنت پێداوم کە لە ڕۆژی قیامەتدا شەرمەندەم نەکەیت، جا چ شەرمەندەیەك لەوە گەورەترە کە من باوکی خۆم لەناو ئاگردا ببینم؟ واتە داوای ڕزگاربونی باوکی دەکات، بەڵام ﷻ دەفەرموێ: بەڕاستی من بەهەشتم لە کافران قەدەغە کردوە، واتە: باوکیشت کافرەو نای بەخشم }

(٨٨) ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە نە ماڵو نە منداڵ سوودیان نیەو بەکار نایەن، بەڵکو لەسەر ماڵ دوو پرسیارت لێ دەکرێت چۆنت دەرهێناو چۆنت خەرج کردو پرسیاری کوڕانیش لە باوكو باوکیش لە کوڕان دەکات، هەمو کەسێك لەوڕۆژەدا تەنها خۆی

قَالَ وَمَا عِلۡمِي بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنۡ حِسَابُهُمۡ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّيۖ لَوۡ تَشۡعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَآ أَنَا۠ بِطَارِدِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنۡ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴿١١٥﴾ قَالُواْ لَئِن لَّمۡ تَنتَهِ يَٰنُوحُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمَرۡجُومِينَ ﴿١١٦﴾ قَالَ رَبِّ إِنَّ قَوۡمِي كَذَّبُونِ ﴿١١٧﴾ فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿١١٩﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗۖ وَمَا كَانَ أَكۡثَرُهُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿١٢١﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٢٢﴾ كَذَّبَتۡ عَادٌ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ لَهُمۡ أَخُوهُمۡ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٍۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبۡنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةٗ تَعۡبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمۡ تَخۡلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشۡتُم بَطَشۡتُمۡ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِيٓ أَمَدَّكُم بِمَا تَعۡلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنۡعَٰمٖ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّٰتٖ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿١٣٥﴾ قَالُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡنَآ أَوَعَظۡتَ أَمۡ لَمۡ تَكُن مِّنَ ٱلۡوَٰعِظِينَ ﴿١٣٦﴾

مەبەستەو تەنها بیرو باوەڕی ڕاستە کە لەو ڕۆژەدا سوودی دەبێت وەك دەفەرموێ:

(٨٩) جگە لەو کەسەی کە بە دڵێکی سافەوە دەگات بە ﷲ، دڵێکی ساف وا کە خاڵی بێت لە تاوانو شیركو بیدعەو بە ئارام بێت لەسەر سوننەتی پێغەمبەرﷺ.

(٩٠) جا ئەو ڕۆژە بەهەشت لە پارێزکارانەوە نزیك دەکرێتەوە.

(٩١) ئەوسا دۆزەخیش بۆ گومڕایان ئاشکرا دەکرێتو دەیبینن.

(٩٢) وە لەو ڕۆژەدا پێیان دەوترێت لە کوێن ئەوانەی دەتان پەرست؟

(٩٣) ئەوانەی جگە لە ﷲ، ئایا یارمەتیتان دەدەن؟ یان ئەوان دەتوانن یارمەتی خۆیشیان بدەن؟ واتە: نە دێن بە هاوارتانەوەو نە پارێزگاری خۆیشیان پێدەکرێت. ﴿ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ / پەرستندەو پەرستراو هەردووکیان لەو ڕۆژەدا لاوازن﴾

(٩٤) جا ئەو پەرستراوانەو ئەو گومڕایانەی کە ئەوانیان دەپەرست هەردووکیان تووڕ دەدرێنە ناویەوە.

(٩٥) خۆ سەرجەمی سەربازانی شەیتانیش دەخرێنە ناویەوە.

(٩٦) جا لەحاڵێکدا کە ئەوان لەناوئەو دۆزەخدایدا لەدژی یەکتر دەدونو دەڵێن:

(٩٧) بە ﷲ قەسەم ئێمە لە گومڕاییەکی ئاشکرادا بووین ،

(٩٨) ئەو کاتەی کە ئێوەمان لەگەڵ پەروەردگاری جیهانیاندا بە یەکسان دادەناو فورمانی ئێوەمان وەکو فەرمانی ﷲ جێ بەجێ دەکرد.

(٩٩) خۆ هەر تاوانباران بون کە ئێمەیان هەڵدێراو گومڕایان کردین.

(١٠٠) جا وا ئێستا نە تکاکارانێکمان هەیە تکایەکمان بۆبکەن.

(١٠١) وە نە دۆستێکی دڵسۆزمان هەیە کە بێن بە هانامانەوەو لەم ئاگرەی دۆزەخ ڕزگارمان بکەن، ئاوایە سەرئەنجامی ملهوڕانو شوێنکەوتوانیان کە لەناو ئەو سزایە بەگژ یەکدا دەچن هەریەکەی ئەویتر تاوانبار دەکاتو لەوێدا پەشیمان دەبنەوەو دەڵێن :

(١٠٢) خۆ ئەگەر جارێکیتر بگەڕاینەوە بۆ دنیا ئەوسا ئیتر لە باوەڕداران دەبین، بەڵام ﷲ دەزانێت کە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دنیا دیسان دەگەڕێنەوە سەر بەزمی پێشویان.

(١٠٣) بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ باوەڕ هێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

(١٠٤) وە بێگومان پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە کافرانو زۆر بە سۆزە بەرامبەر بە باوەڕداران. ئینجا دەچێتە سەر باسی گەلی نوح عليه السلام و دەفەرموێ:

(١٠٥) گەلی نوح باوەڕیان نەکرد بە پێغەمبەران. گەلی نوح یەك پێغەمبەریان بووە کە نوحەو نۆ سەدو پەنجا ساڵ لەناویاندا بووەو جگە لە چەند کەسێکی زۆر کەم باوەڕیان پێ نەکرد، جا چونکە باوەڕ نەکردن بە پێغەمبەرێك بە مانای باوەڕ نەکردن بە هەمو پێغەمبەرانە، بۆیە لەم داستانانەدا بێباوەڕی هەمو گەلێك بە پێغەمبەرەکەی بە بێباوەڕبون بە هەمو پێغەمبەران دادەنێ.

(١٠٦) جا بیریان بخەرەوە ئەو کاتەی کە (نوح)ی برایان عليه السلام پێی وتن: ئەوە بۆ لە ﷲ ناترسن؟

(١٠٧) بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی دەستو دەم پاکو ئەمینم.

(١٠٨) دەی لە ﷲ بترسنو پەیڕەوی من بکەن.

(١٠٩) خۆ من داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناکەم لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە، بەڵکو پاداشتی من هەر لەلای پەروەردگاری جیهانیانە.

(١١٠) دەی لە اللَّه بترسن‌و پەیڕەوی من بکەن.

(١١١) وتیان: ئایا باوەڕت پێبکەین لە کاتێکدا تۆ هەر مرۆڤانی سادەو ساویلکەت لەگەلدان‌و تۆ دەتەوێت ئێمەش بکەیت بە هاوشانی ئەوان؟

(١١٢) نوح عليه السلام وتی: من نازانم ئەوان چیان دەکردو لە ناو دڵیاندا نیم‌و من ڕواڵەتم لەسەرە مادام ئەوان بە ڕواڵەت باوەڕیان بە من هێناوە بەسە.

(١١٣) ئەگەرهەستتان هەبێ حیسابیان تەنها لەلای پەروەردگارمە نەك لەلای من.

(١١٤) وە من باوەڕداران ناتۆرێنم‌و دەریان ناکەم.

(١١٥)چونکە من جگە لە ترسێنەرێکی ڕوون شتێکی تر نیم.

(١١٦) وتیان: ئەگەر واز لەم بانگەوازەت نەهێنیت ئەی نوح دڵنیابە کە تۆ لە سەنگسار کراوان دەبیت، واتە، بەرد بارانت دەکەین تا دەتکوژین،

(١١٧) ئینجا نوح عليه السلام بە تەواوی لە باوەڕهێنانی گەلەکەی نائومێد بو، جا سکاڵای خۆی لەلای اللَّه کردو وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان گەلەکەم بەدرۆیان خستمەوەو هەڕەشەی کوشتنم لێ دەکەن.

(١١٨) سا تۆ لەنێوان من‌و ئەواندا بڕیاری خۆت بدەو من‌و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە لەگەلم دا ڕزگار بکە، اللَّه یش دوعایەکەی لێوەرگرت.

(١١٩) ئەوسا ئێمە نوح عليه السلام‌و ئەوانەش کە لەگەلیدا بون لەناو ئەو کەشتیە پڕ لە گیانەوەرو مرۆڤانەدا، ڕزگارمان کردن.

(١٢٠) پاشان ئەوانی ترمان نوقمی دەریا کرد.

(١٢١)بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ باوەڕ هێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

(١٢٢) جا بێگومان پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە کافران‌و زۆر بەسۆزە بەرامبەر باوەڕداران. ئینجا دەچێتە سەر داستانی هۆزی عاد کە گەلی هود پێغەمبەر بون‌و دەفەرموێ:

(١٢٣) گەلی عادهەمو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە.

(١٢٤) ئەو کاتەی کە (**هود**)ی برایان عليه السلام پێی وتن: ئەوە بۆلە اللَّه ناترسن؟

إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَٰهُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٥٨﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٥٩﴾

(١٢٥) بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی دەست‌و دەم پاك‌و ئەمینم.

(١٢٦) دەی لە اللَّه بترسن‌و پەیڕەوی من بکەن.

(١٢٧) خۆ من داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناکەم لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە، بەڵکو پاداشتی من لەلای پەروەردگاری جیهانیانە

(١٢٨) ئایا ئێوە لە هەمو جێگای بەرز کۆشك‌و تەلاری دیارو گەورە دروست دەکەن بۆ گاڵتە کردن بەو کەسانەی کە بەلاتاندا گوزەر بکەن .

(١٢٩) وە ئێوە بەنداوی گەورەو گرنگ دروست دەکەن، هیوادارن بۆ هەمیشە لە زەویدا بمێننەوە؟ شتی وانیەو دەبێ بمرن.

(١٣٠) خۆ هەر کاتێکیش شەڕ بکەن دەست دەوەشێنن بە دەست وەشاندنێکی ملهوڕانە، کە هیچ سۆزو نەرمیەکی چاك لە بەرچاو ناگرن.

(١٣١) دەی لە اللَّه بترسن‌و پەیڕەوی من بکەن.

(١٣٢)دەسا بترسن لەو کەسەی کە ئەو هەمو شتانەی پێداون کە خۆتان دەزانن.

(١٣٣) کەمەڕو ماڵات‌و کوڕانی زۆری پێداون.

(١٣٤) وە باخچەگەل‌و کانی ئاوانی زۆریش.

(١٣٥) ئەگەر هەر ئاوەها بن بێگومان من دەترسم لێتان لە سزای ڕۆژێکی گەورە، جا کافران نەك گوێیان لە ئامۆژگاریەکانی نەگرت بەڵکو گاڵتەشیان پێدەکرد.

(١٣٦) وتیان: تۆ ئامۆژگاری بکەیت یان لە ئامۆژگاری کەران نەبیت‌و بێدەنگ بیت لای ئێمە یەکسانەو گوێت بۆ ناگرین.

(١٣٧) ئەمەی کە تۆ باسی دەکەیت جگە لە درۆو دەلەسەی پێشوان هیچی تر نیە، یان ئەوەی کە ئێمە دەی کەین شتێك جگە لەوە نیە کە پێشوانی ئێمە کردویانەو ئێمەش بە شوێن ئەواندا دەڕۆین. وشەی﴿خُلُقُ ٱلۡأَوَّلِينَ﴾ کە بەمانای ئەخلاق‌و هەڵسوکەوتی پێشوانە بە ﴿خَلْقُ الْأَوَّلِينَ/ دروستکراوی پێشوان﴾ دەخوێنرێتەوەو هەردوویشیان سەحیحن.

(١٣٨) خۆ ئێمە هەرگیزسزا نادرێین.

(١٣٩) جا ئەوان (هود)یان‌ﷺ بەدرۆ خستەوە، ئەوسا ئێمەش لەناومان بردن بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ باوەڕ هێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

(١٤٠) جا بێگومان پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە کافران‌و زۆر بەسۆزە بەرامبەر بە باوەڕداران. ئینجا دێتە سەر باسی گەلی (سەمود) کە هۆزی (ساڵح) پێغەمبەرە ﷺ و دەفەرموێ:

(١٤١) گەلی سەمود پێغەمبەرانیان بەدرۆخستنەوە.

(١٤٢) ئەو کاتەی کە براکەیان ساڵح پێی وتن: ئەوە بۆ لە الله ناترسن؟

(١٤٣) بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێکی دەستو دەم پاك‌و ئەمینم.

(١٤٤) دەی لە الله بترسن‌و پەیرەوی من بکەن.

(١٤٥) خۆ من لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناکەم، بەڵکو پاداشتی من لەلای پەروەردگاری جیهانیانە.

(١٤٦) ئایا وازتان لێ دەهێنرێت لێرەدا وا بە بێترس‌و بەخۆشی بژین لەگەڵ ئەو هەمو لاساری‌و تاوانانەدا کەدەیکەن؟

(١٤٧) لە ناو باخچەگەل‌و کانی ئاواندا،

(١٤٨) وە لەناو کێڵگەکان‌و دارخورماگەلێك کە هێشوەکانی وەك گۆزەی بچوك‌و نەرم‌و نۆڵن.

(١٤٩) وە لەناو چیاکاندا زۆر بە لێزانی ماڵانی گەورەو فرەوان دروست دەکەن تا ئیتر بومە لەرزە کار لەماڵەکانتان نەکات‌ونەڕوخێن. خۆ ئەوان لەبەر تەمەن درێژیان ماڵی قوڕو بەرد بەرگەی نەدەگرتن، جا دووبارە پێیوتنەوە:

(١٥٠) دەی ئیتر لە الله بترسن‌و پەیرەوی لە من بکەن،

(١٥١) پەیرەوی فەرمانی هەڵەکارانی زیادەڕەۆ مەکەن.

(١٥٢) ئەوانەی کە لە زەویدا خراپە بڵاو دەکەنەوەو ئیشی چاك ناکەن، واتە: سەرۆك‌و گەورەکانیان کە بانگیان دەکەن بۆ شیرك‌و کوفرو دژایەتی ئایین، جا ئەوان لەجیاتی وریا بونەوەو ڕووکردنە خواناسی‌و پەیرەوی کردنی پێغەمبەرەکەیان،

(١٥٣) وتیان: تۆ تەنها لەوانەیت کە زۆر جادویان لێکراوەو هۆش‌و عەقڵیان لەدەست داوە، تۆ عەقڵ‌و هۆشت نەماوە.

(١٥٤) تۆش هەر مرۆڤێکی وەك ئێمە، جا ئەگەر لە ڕاستگۆیانیت دەی بەڵگەیەکمان بۆ بهێنە لەسەر پێغەمبەرایەتی خۆت.

(١٥٥) ساڵح ﷺ وتی: ئەمە حوشترێکە کە لەسەر داخوازی خۆتان وەکو موعجیزەیەك الله بە منی داوە، جا ئەو ئاوەی کە هەتانە ڕۆژێکی بۆ ئەوەو ڕۆژێکی دیاریشی بۆ ئێوەیە، جا ئەو ڕۆژەیش بۆ ئەوە ئێوە لە شیری ئەو حوشترە دەخۆن.

(١٥٦) بە خراپە دەستی بۆ درێژ مەکەن، چونکە الله بۆ تاقیکردنەوەی ئێوە دروستی کردوە، جا ئەگەر دەست درێژیتان کردە سەری سزای ڕۆژێکی گەورە دەتان گرێتەوە، بەڵام ئەو گەلە لاسارە ئەم قسەیشیان وەکو باقی قسەکانی تری گوێ پێ نەدا.

(١٥٧) ئەوسا خراپترین کەسیان بە بڕیاری هەمویان هەڵی کوتایە سەری‌و سەری بڕی ئینجا زانیان کە ئیشەکەیان خراپ بووە پەشیمان بونەوە، بەڵام پاش چی؟ پاش ئەوەی کە دڵنیابون تۆڵەیان لێوەردەگیرێت، چونکە ساڵح ﷺپاش سەربڕینی وتی: پاش سێ ڕۆژی تر سزا دەدرێن جا دەڵێن، ڕۆژی **یەکەم** دەم‌و چاویان زەرد بو، ڕۆژی **دووەهەم** سور بو، ڕۆژی **سێهەم** ڕەش بو.

(١٥٨) جا سزا گرتنیەوە کە دەنگێك بو هەمویان لە ترسا زەندەقیان چو ومردن بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ باوەڕهێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

(١٥٩) خۆ بێگومان پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە کافران‌و زۆر بەسۆزە بەرامبەر باوەڕداران.

(١٦٠) ئینجا دەچێتە سەر داستانی گەلی لوت‌و دەفەرموێ: گەلی لوت هەمو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستنەوە

كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٦٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ ٱلذُّكْرَانَ مِنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٦٥﴾ وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا۟ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ يَـٰلُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ كَذَّبَ أَصْحَـٰبُ لْـَٔيْكَةِ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٩﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٨٠﴾ ۞ أَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِي ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾

﴿١٦١﴾ ئەو كاتەی كە (**لووت**)ی برایان ﷺ پێی وتن: ئەوە بۆ لە ﷲ ناترسن؟ لووت كە برازای ئیبراهیمەو كلدانی یان كوردەو گەلەكەی عەرەب بون، واتە: نە بە نەسەبو نە بە ئایین یەك نەبون كەچی بە برایانی ناو دەبات؟ واتە: مرۆڤ لە بنەڕەتدا هەموی بەرەی یەك باوكو دایكن، بەم بۆنەوە وشەی برا بەكارهێنان بۆ یەكتری دروستە، واتە: برایەتی یان نەسەبیە یان ئایینیە یان مرۆڤایەتیە، بەكارهێنانی وشەی برا بە هەر كام لەم مەبەستانە بێت باشەو كێشەیەكی ئایینی نیە.

﴿١٦٢﴾ بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێكی دەستو دەم پاكو ئەمینم.

﴿١٦٣﴾ دەی لە ﷲ بترسنو پەیڕەوی من بكەن.

﴿١٦٤﴾ خۆ من داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناكەم لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە، بەڵكو پاداشتی من لەلای پەروەردگاری جیهانیانە.

﴿١٦٥﴾ بۆچی ئێوە لەناو ئەم خەڵكەی جیهاندا پەلاماری نێرینە دەدەن بۆ ئیشی ناپەسەندی نێربازی؟

﴿١٦٦﴾ جا واز لە هاوسەرانێك دەهێنن كە پەروەردگار بۆ ئێوەی دروستكردون؟ بەڕاستی ئێوە گەلێكن هەمو سنورێكتان بەزاندوەو غیرەتو مەردایەتیتان لەدەست داوە، جا بەم قسانەی لووت ﷺ لەجیاتی پەشیمان بونەوەو بەخۆدا چوونەوە، بەرامبەری وەستان،

﴿١٦٧﴾ وتیان: ئەی لووت بێگومان ئەگەر واز لەو قسەوباسانە نەهێنیت تۆ لە دەركراوان دەبیت واتە لە وڵاتی خۆمان دەرت دەكەین، جا لووتیش ﷺ بێزاری خۆی لەو كردارە ناشیرینەی ئەوان دەربڕی،

﴿١٦٨﴾ وتی: بێشك من لەوانەم كە ڕقی لەو كردارانەی ئێوەیە.

﴿١٦٩﴾ ئەی پەروەردگارم منو خاوخێزانم ڕزگار بكە لە سزای ئەو كارەپیسەی كە ئەوان دەیكەن، پەروەردگاریش نزاكەی وەرگرتو فەرموی:

﴿١٧٠﴾ ئەوسا ئێمەیش خۆیوهەمو خاوخێزانیو شوێنكەوتوانیمان ڕزگار كرد.

﴿١٧١﴾ جگە لە پیرەژنەكەی كە لەناو ئەوانەدا بۆچەشتنی سزا هێشتمانەوە چونكە لایەنگری ئەوخراپەكارانەی دەكرد.

﴿١٧٢﴾ لە پاشان ئەوانی ترمان لەناوبرد.

﴿١٧٣﴾ جا بارانی بەردمان بە سەردا باراندن ئای چەند خراپە بارانی ترسێنراوان.

﴿١٧٤﴾ بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەكی گەورە هەیە بۆ باوەڕ هێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

﴿١٧٥﴾ خۆ بێگومان پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە كافرانو زۆر بەسۆزە بەرامبەر بە باوەڕداران.

﴿١٧٦﴾ پاشان باسی داستانی خاوەنانی دارستان كە گەلی شوعەیب پێغەمبەرە ﷺ دەكاتو دەفەرموێ: خاوەنی دارستانەكان هەمو پێغەمبەرانیان بەدرۆخستنەوە.

﴿١٧٨﴾ ئەو كاتەی كە (شوعەیب) ﷺ پێی وتن: ئەوە بۆ لە ﷲ ناترسن؟

﴿١٧٧﴾ بێگومان من بۆ ئێوە پێغەمبەرێكی دەستو دەم پاكو ئەمینم.

﴿١٨٠﴾ دەی لە خوا بترسنو پەیڕەوی من بكەن.

﴿١٧٩﴾ خۆ من داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناكەم لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە، بەڵكو پاداشتی من لەلای پەروەردگاری جیهانیانە.

وَٱتَّقُواْ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ وَٱلْجِبِلَّةَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٨٥﴾ وَمَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا وَإِن نَّظُنُّكَ لَمِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿١٨٦﴾ فَأَسْقِطْ عَلَيْنَا كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٨٧﴾ قَالَ رَبِّىٓ أَعْلَمُ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمْ عَذَابُ يَوْمِ ٱلظُّلَّةِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٨٩﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٩٠﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٩١﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِىٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَفِى زُبُرِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٩٦﴾ أَوَلَمْ يَكُن لَّهُمْ ءَايَةً أَن يَعْلَمَهُۥ عُلَمَٰٓؤُاْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٩٧﴾ وَلَوْ نَزَّلْنَٰهُ عَلَىٰ بَعْضِ ٱلْأَعْجَمِينَ ﴿١٩٨﴾ فَقَرَأَهُۥ عَلَيْهِم مَّا كَانُواْ بِهِۦ مُؤْمِنِينَ ﴿١٩٩﴾ كَذَٰلِكَ سَلَكْنَٰهُ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٠٠﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ حَتَّىٰ يَرَوُاْ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٢٠١﴾ فَيَأْتِيَهُم بَغْتَةً وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٠٢﴾ فَيَقُولُواْ هَلْ نَحْنُ مُنظَرُونَ ﴿٢٠٣﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿٢٠٤﴾ أَفَرَءَيْتَ إِن مَّتَّعْنَٰهُمْ سِنِينَ ﴿٢٠٥﴾ ثُمَّ جَآءَهُم مَّا كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٢٠٦﴾

(١٨١) وا دیاره ئەو گەلە سەرەڕای خراپی تاوانیان لە كێشانەو پێوانەشدا زۆر خراپ بوون بۆیە بەو شێوەیە ناویان دەباتو دەفەرموێ: شوعەیب ﷺ پێی وتن: بە تێرو تەواوی پێوانە بكەنو لەوكەسانە مەبن كە زیان گەیەنەرن بە خەڵك، بۆ خۆیان بەمەنی گەورە وەردەگرنو بە مەنی بچوك بە خەڵك دەفرۆشن.

(١٨٢) ئەوسا بە میزانێك شت بكێشن چ بۆ كڕینو چ بۆ فرۆشتن راست بێتو گزی لە خەڵك مەكەن. كەلوپەلو سامانی خەڵك كەم مەكەنەوە بە گزیكردن لە ڕێگای پێوانەو كێشانەوە . پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ:{مَنْ غَشَّنَا فَلَيْسَ مِنَّا /متفق عليه/ هەركەسێك گزیمان لێ بكات لەئێمەنیە}

(١٨٣) جا لە زەویشدا خراپە بلاومەكەنەوە.

(١٨٤) دەی بترسن لەو زاتەی كە ئێوەو خەڵكانی پێش ئێوەیشی دروستكردوە، بەڵام ئەو گەلە لە جیاتی وەرگرتنی فەرمانەكانیو پەیڕەوی كردنی.

(١٨٥) وتیان: تۆ هەر لەوكەسانەی كە جادویان لێكراوەو نازانی چی دەڵێیتو ئاگات لەخۆت نیە.

(١٨٦) خۆ تۆیش هەر مرۆڤێكی وەكو ئێمەو هیچت لە ئێمە زیاد نیە.

(١٨٧) جا بێگومان ئێمە وا گومانت پێدەبەین كە تۆ لە درۆزنانیت.جا ئەگەر وا نیە دەی چەند پارچەیەكمان لە ئاسمانەوە بۆ بەردەوە ئەگەر تۆلە ڕاستگۆیانیت،

(١٨٨) وتی: پەروەردگارم لە هەمو كەس چاكتر دەزانێت بەوەی كە ئێوە دەیكەن، جا ئەگەر شایستەی سزا بن سزاتان دەداتو ستەمتان لێ ناكات، هەروایش بو ﷲ تۆڵەیەكی ڕێكی كردەوەكانیانی لێ سەندن.

(١٨٩) جا ئەوان شوعەیبیان ﷺ بەدرۆ خستەوە ئەوسا سزای ڕۆژی سێبەر قۆستنیەوە. بێگومان ئەوە سزای ڕۆژێكی زۆر گەورە بو. موفەسیرین لێرەدا دەڵێن: پاش ئەوەی كە ئەوان بەو ئامۆژگاریەی شوعەیب لەتاوانو گزی لەپێوانەو كێشانەدا وازیان نەهێنا دوچاری گەرماییەكی زۆربون بۆماوەی هەفتەیەك پاشان هەورێك هاتو سێبەری كردو هەمویان چونە ژێر سێبەرەكەوە جا زەوی هاتە جموجوڵو دەنگێكی گەورە گرتنیەوەو سێبەرەكەش بو بە یەك پارچە ئاگرو هەمویانی سوتاند.

(١٩٠) بێگومان لەم ڕووداوەدا بەڵگەیەكی گەورە هەیە بۆ باوەڕ هێنان بەڵام زۆربەیان باوەڕ ناهێنن.

(١٩١) خۆ بێگومان پەروەردگارت زۆر بە توانایە بۆ تۆڵە سەندن لە كافرانو زۆر بەسۆزە بەرامبەر بە باوەڕداران. بەم شێوەیە ئەم حەوت داستانە كۆتای پێ هات ئینجا دێتە سەر باسی ئەم قورئانە گەورەو پڕ فەڕو خێرەو دەفەموێ:

(١٩٢) ئەوەی كە لە سەرەتای ئەم سورەتەوە باسی هات، ئەوە ڕەوانەكراوی پەروەردگاری جیهانیانە.

(١٩٣) كەبۆ گەیاندنی ئەم پەیامە جبرائیل هاتوە.

(١٩٤) تابیگەیەنێت بە دڵی تۆ، تا تۆیش بۆ ئەم گەلەی خۆت لە ترسێنەران بیت بە سزای دنیاو تۆڵەی دۆزەخ بۆ ستەمكاران.

(١٩٥) بە زمانێكی عەرەبی پاراوو ڕوونكەرەوەو ئاسان، تا هیچ كەسێك بە هانەی نەمێنێت بۆ پاشەڕۆژ.

(١٩٦) ئەوسا بێگومان ئەم قورئانە لە پەرتوكەكانی پێشودا وەك تەوراتو ئینجیل باسیكراوە.

(١٩٧) دەی ئایا هەروا لەسەر لاساریو دژایەتی ئەم قورئانە دەڕۆن مەگەر ئەمە بۆ ئەوان بەڵگەیەكی زانیاریی گەورەی نیە كە نەوەی ئیسرائیل دەزانن كە ئەم پێغەمبەرەﷺڕاستەو تەنانەت جێگای هاتنیشی دەزانن؟ لەوانە عەبدوڵای كوڕی سەلام كەیەكێك

بو لەزانا گەورەکانی ئەوسەردەمەی جوەکانی مەدینەو شایەتی لە سەر راستی پێغەمبەر ﷺداو موسڵمان بو ئینجا راستیە شاراوەکانی ناوتەوراتیشی سەبارەت بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری ﷺ ئاشکراکرد، خوالێی رازی بێ . دیسان قورئان باسی کەللە ڕەقیو کوفری ناقوڵای قورەیش دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٩٨﴾ ئەگەر ئێمە ئەم قورئانە عەرەبیەمان ڕەوانەی لای هەندێ کەس بکردایە کە لە عەرەبیدا هیچ شارەزاییەکی نەبوایە،

﴿١٩٩﴾ جا ئەویش بەسەر ئەوکافرانەی قورەیشی بیخوێندایەوە باوەڕیان بەو قورئانە نەدەهێنا، واتە: خوا نەناسان لەبەر تۆ نیە ئاوا دژایەتی دەکەن بەڵکو هەر خۆیان سروشتیان وایەو دژی ڕاستیو خوا ناسیی ڕاستەقینەن.

﴿٢٠٠﴾ هەر ئاوەها بەهۆی لاساریو کەللە ڕەقی خۆیانەوە کوفرو سەرکەشیو دژایەتی ئەم قورئانەو ئاینمان خستە ناو دڵیانەوە.

﴿٢٠١﴾کە باوەڕ بەو قورئانە ناکەن هەتا ئەو سزا بە ئێشو ئازارە بە چاوی خۆیان نەبینن.

﴿٢٠٢﴾ دەی سا چاك بزانن کە ئەو سزا بە ئێشەیان لەناکاو کەهیچ هەستی پێ ناکەن بۆ دێتو دەیانگرێت.

﴿٢٠٣﴾ ئەوسا کە سزا هات دەڵێن: ئایا مۆڵەتمان پێدەدرێت؟ بەڵێ لە پێشەوە گاڵتەیان بە هەڕەشەکان دەکردو دەیانوت کوا؟ ئەگەر ڕاست دەکەیت با سزا بێت، وا ئیستاش کەدەیبینن داوای ماوەپێدان دەکەن!

﴿٢٠٤﴾ دەی ئیتر بۆچی پەلەی هاتنی سزا ی ئێمە دەکەن ؟ بەڕاستی خوانەناسان نەزانو گێلو گەمژەن.

﴿٢٠٥﴾ پێم بڵێ: ئەگەر چەندین ساڵیش بەخۆشیش بیانژێنین،

﴿٢٠٦﴾ لە پاشان ئەو سزایەی کە ئەوانی پێ ترسێنراوە هاتە سەریان،

﴿٢٠٧﴾ چ سوودێکیان پێدەگەیەنێت ئەو خۆشیو ڕابواردنانەیان؟ ئینجا پەروەردگار تێمان دەگەیەنێت کە ستەم لە کەس ناکاتو تۆڵەی لە کەس نەسەندوە هەتا پەیامی پێ نەگەیشت بێتو دەفەرموێ:

﴿٢٠٨﴾ هیچ شارێکمان لەناو نەبردوە مەگەر ترسێنەرانیان بۆ هاتبێتو ئەوان پەیامی ﷲیان پێ گەیاند بن، جا ئەوانیش دژایەتیان کردبێت.

مَآ أَغۡنَىٰ عَنۡهُم مَّا كَانُواْ يُمَتَّعُونَ ﴿٢٠٧﴾ وَمَآ أَهۡلَكۡنَا مِن قَرۡيَةٍ إِلَّا لَهَا مُنذِرُونَ ﴿٢٠٨﴾ ذِكۡرَىٰ وَمَا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٠٩﴾ وَمَا تَنَزَّلَتۡ بِهِ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢١٠﴾ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُمۡ وَمَا يَسۡتَطِيعُونَ ﴿٢١١﴾ إِنَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّمۡعِ لَمَعۡزُولُونَ ﴿٢١٢﴾ فَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُعَذَّبِينَ ﴿٢١٣﴾ وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ ﴿٢١٤﴾ وَٱخۡفِضۡ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢١٥﴾ فَإِنۡ عَصَوۡكَ فَقُلۡ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٢١٦﴾ وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢١٧﴾ ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ﴿٢١٨﴾ وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٢١٩﴾ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٢٢٠﴾ هَلۡ أُنَبِّئُكُمۡ عَلَىٰ مَن تَنَزَّلُ ٱلشَّيَٰطِينُ ﴿٢٢١﴾ تَنَزَّلُ عَلَىٰ كُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٖ ﴿٢٢٢﴾ يُلۡقُونَ ٱلسَّمۡعَ وَأَكۡثَرُهُمۡ كَٰذِبُونَ ﴿٢٢٣﴾ وَٱلشُّعَرَآءُ يَتَّبِعُهُمُ ٱلۡغَاوُۥنَ ﴿٢٢٤﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّهُمۡ فِي كُلِّ وَادٖ يَهِيمُونَ ﴿٢٢٥﴾ وَأَنَّهُمۡ يَقُولُونَ مَا لَا يَفۡعَلُونَ ﴿٢٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَذَكَرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱنتَصَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا ظُلِمُواْۗ وَسَيَعۡلَمُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ أَيَّ مُنقَلَبٖ يَنقَلِبُونَ ﴿٢٢٧﴾

٢٧ سُورَةُ النَّمۡلِ ٩٣

﴿٢٠٩﴾ ئەمەی باسمان کرد پەندو ئامۆژگاریەو ئێمە ستەمکار نینو هەر کەسو گەلو هۆزێك بە گوێرەی کرداری خۆی ڕەفتاری لەگەل دا دەکەین.

﴿٢١٠﴾ جا شەیتانەکان ئەم قورئانەیان دانەبەزاندوە،

﴿٢١١﴾ خۆ بۆ یشیان نیە کەئەم کارە بکەنو نایشتوانن چونکە سروشتی ئەوان کوفرو فەسادو گومراییەو ئەم قورئانە پڕیەتی لە ڕەوشت بەرزیو فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە، جا ئەوان چۆن شتی وادەکەن؟

﴿٢١٢﴾ بێگومان کە ئەوان لە بیستنی قسەی فریشتەکان بێبەش کراونو هیچ هەواڵێکی تەواوی ئاسمان نابیسن ئیتر چۆن دەتوانن پەیامێکی گرنگوموعجیزەی ئاوەها بهێنن؟. جائەم بۆچونەیشتان هەروەکو بۆچونەکانی ترتان بێ سەروبەرەو تەنها خۆ خەڵەتاندنەو بۆفریودانی گەمژەو ساویلکەکانی ژێر دەستتانن.

﴿٢١٣﴾ ئەوسا لەگەل پەرستنی ﷲ دا کەسێکی تر نەپەرستیت، چونکە بەو بەندایەتیە لە ڕیزی سزادراواندا دەبیت.

﴿٢١٤﴾ جا خزمانی نزیکترت بترسێنە لە سزای سەختی هەردوو ژیان ئەگەر حەقو ڕاستی وەرنەگرن، بەڵێ بەڕاستی پێغەمبەری ئازیز ﷺ ئەم پەیامەی پێشەکی بە گوێی خزمانی نزیکی خۆیدا

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ﴿١﴾ هُدٗى وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ يُوقِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ زَيَّنَّا لَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُمۡ يَعۡمَهُونَ ﴿٤﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَهُمۡ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ وَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡأَخۡسَرُونَ ﴿٥﴾ وَإِنَّكَ لَتُلَقَّى ٱلۡقُرۡءَانَ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ عَلِيمٍ ﴿٦﴾ إِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِأَهۡلِهِۦٓ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا سَـَٔاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ ءَاتِيكُم بِشِهَابٖ قَبَسٖ لَّعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ﴿٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهَا نُودِيَ أَنۢ بُورِكَ مَن فِي ٱلنَّارِ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨﴾ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّهُۥٓ أَنَا ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٩﴾ وَأَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰ لَا تَخَفۡ إِنِّي لَا يَخَافُ لَدَيَّ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٠﴾ إِلَّا مَن ظَلَمَ ثُمَّ بَدَّلَ حُسۡنَۢا بَعۡدَ سُوٓءٖ فَإِنِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَدۡخِلۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖۖ فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ﴿١٢﴾ فَلَمَّا جَآءَتۡهُمۡ ءَايَٰتُنَا مُبۡصِرَةٗ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾

دا، ئینجا بەم لاو ئەولادا، لە عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە هاتوە کە کاتێك پێغەمبەرمان ﷺ چوەتە سەر تەپۆڵکەی (سەفا)و بە دەنگێکی بەرز بانگی لە خزمانی کرد کە قوریشەو ئەوانیش هەمویان یان خۆیان یان کەسێکیان نارد کە کۆبونەوە لە دەوریو فەرموی: ئەی کوڕانی عەبدولموتەلیب ئەی کوڕانی فیهر ئەی کوڕانی لوئەی، پێم بڵێن: ئەگەر پێتان بڵێم کە لە پشت ئەم چیایە کۆمەڵە سوارێك دەیانەوێت لەناکاو بدەن بە سەرتاندا باوەڕم پێ دەکەن؟ وتیان: بەڵێ، فەرموی: دەی من ترسێنەرێکم بۆتان پێش هاتنی سزایەکی توند. جا ئەبو لەهەبی مامی وتی: لەناوبچیتو لەمرۆ بە دوا نەژیت، هەر بۆ ئەمە بانگت کردین، پێغەمبەر وەڵامی نەدایەوە بەڵام الله ﴿تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ..الی قوله..مَّسَدِۭ ﴿٥﴾﴾ مەسەد: ١ - ٥ لە وەڵامی (ئەبولەهەب)دا نارد. تادوارۆژ ئەم جنێوە ڕۆژانە سەدانوهەزاران جار بە ئەبو لەهەب دەوترێت. خوا بەلوتفت لە تورەیی خۆت بمان پارێزی. ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٢١٥) باڵی سۆزو میهرەبانیت دانەوێنە بۆ پەیڕەوانی باوەڕدارتو نەرمونیان بە لەناویاندا.

(٢١٦) ئەوسا ئەگەر ئەوان دژایەتی تۆیان کرد، سا تۆیش بڵێ: بەڕاستی من بێزارم لەو کردارو قسە ناپەسەندانەی کە ئێوە دەیکەن.

(٢١٧) جا خۆت بە خاوەن دەسەڵاتوبێنیهایەت میهرەبان بسپێرەو باکت لە کەس نەبێت، بەڵێ، هەر خۆی بەسە.

(٢١٨) ئەو زاتەی کە چاوی لێتە هەر کاتێك هەڵدەستیت بۆ ئیشێك، واتە: چاودێرو پارێزەرتە لە هەمو کاتێکدا.

(٢١٩) خۆ چاوی لە هەڵسو کەوتتە لەناو سوجدەبەرانیشدا.

(٢٢٠) چونکە بێگومان ئەو خۆی بیسەری هەمو قسەو گفتوگۆیەکەو زانەری هەمو ڕەفتارێکە.

(٢٢١) جا دەفەرموێ: پێتان بڵێم: شەیتانەکان بۆ سەر کێ دێنە خوا ڕەوە و قسە بۆ کێ دێنن؟

(٢٢٢) بۆ سەر هەمو درۆزنێکی تاوانبار دادەبەزن، جاخۆ ئەی قوریش هەموتان شایەتن لەسەر ڕاستگۆیو ئەمینی محمدﷺ.

(٢٢٣) کە ئەوان گوێ لە فریشتەکان ڕادەگرن تا شتێکیان دەست بکەوێتو بیدەن بە گوێی درۆزنو تاوانبارەکاندا واتە فاڵچیو جادووگەران، کە لەسەد قسە قسەیەکی ڕاستە. کەواتە محمدی ڕاستگۆ ﷺ ناگونجێ بڵێیت شەیتانەکان دێنە لای، هەروەها ناگونجێ بڵێیت ئەم قورئانە ڕێكو ڕەوانو پڕ لە ژیریو دانایە قسەی شاعیرانە.

(٢٢٤) چونکە شاعیران لاڕێو گومڕایان پەیڕەوییان دەکەن نە مرۆڤی ژیرو دانا.

(٢٢٥) مەگەر نەت بینیون سەرگەردانو سەر لێشێواوانو بە هەمو شیوێکدا دەچنو لەهەمو ڕاستو ناڕاستێ دەدون؟

(٢٢٦) خۆ بێگومان ئەوان شتێك دەڵێن کە خۆیان نایکەن.

(٢٢٧) مەگەر ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردووە لە قسەو شیعرەکانیاندا زۆر یادی الله دەکەن، پاش ئەوەی کە ستەمیان لێکراوە ئەوانیش بە شیعرەکانیان تۆڵەی خۆیان وەردەگرنەوەو ستەم ناکەن. وە بەم زوانە ئەوانەی کە ستەمیان کردوە چ بە هۆنراوەو چ بە غەیری هۆنراوە دەزانن بەرەو کوێ دەچن، بەڵێ لەو شاعیرانەی کە الله بە چاکی باسیان دەکات ئەوانە بون کە لە خزمەتی پێغەمبەری ئازیزماندا ﷺ بە هۆنراوەکانیان پارێزگاریان لە پێغەمبەرﷺ و ئاینی ئیسلام دەکرد وەکو حەسانی کوڕی سابیتو عەبدوڵای کوڕی ڕەواحەو کەعبی کوڕی مالیك، خوا پاداشتی خێری هەمویان بداتەوە.

## ٢٧ سورەتی نەمل ٩٣

سورەتی نەمل کە سورەتی " سلیمان" یشی پێدەوترێت، سورەتی بیستو حەوتەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، نەوەدو سێ ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چلو هەشتەمەو پاش سورەتی (الشعراء)و پێش (القصص) دابەزیوە،

وشەی(اَلنَّمۡلُ / مێورلە) دووجارو (نَمۡلَةٌ) یەکجار لە قورئاندا هاتون ئەویش تەنها لە ئایەتی هەژدەی ئەم سورەتەدایە.

بەناوی اَللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) تا سین. هەر خوا خۆی دەزانێت مانای چییە. ئەمە نیشانەکانی ئەم قورئانەیەو پەڕاوی دەرخەری ڕاستو ناڕاستە.

(٢) ڕینمونیکەرو موژدەدەرە بۆ باوەڕداران بە نازو نیعمەتی بەردەوامی بەهەشت.

(٣) ئەوانەی کە نوێژەکانیان بە ڕێكو پێکی دەکەنو زەکات دەدەن، خۆ ئەوان دڵنیان بە هاتنی دوارۆژو زیندوبونەوەو حیساب.

(٤) بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان بە دوارۆژ نیە کردارە خراپەکانیانمان بۆ جوان کردونو بە هەڵسوکەوتی نا لەباری خۆیان شادمانن، جا ئەوان بەڕاستی بێ ئاگاو سەرگەردانن.

(٥) ئەوانە کەسانێکن لە دنیادا خراپترین سزایان بۆ هەیەو لە دوارۆژیشدا هەر ئەوان زیان لێکەوتوترو ڕەنجەڕۆترن.

(٦) جا بێگومان کە تۆ لەلایەن زاتێکی داناو زۆر زاناوە ئەم قورئانەت پێگەیشتوە. ئینجا بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرمانﷺ، اَللَّهُ بە کورتی باسێ لەپێغەمبەرایەتی موسا عليه السلام دەکاتو دەفەرموێ:

(٧) بیر بکەرەوە لەو کاتەی کە موسا عليه السلام کاتێك شەو بەخۆیو خێزانی دەڕۆیشتنو ڕێیان لێ هەڵە بو، جا لەو کاتەدا موسا عليه السلامئاگرێکی بینیو بە خاو خێزانی وت: من ئاگرێك دەبینم ئێوە لێرەدا بوەستن تا من بچم بۆ لای ئەو ئاگرە بەڵکو لەوێ کەسێك هەبێت هەواڵی ڕێگای لێ وەربگرم یان دەستە وارەیەك ئاگر بهێنم بەڵکو ئاگرێکی پێ بکەنەوەو خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە.

(٨) جا کاتێك کە لێی نزیك بوویەوە بانگ کراو پێی وترا: بە پیتو پیرۆزە ئەوەی کە لەناو ئەم ئاگرەدایەو ئەوەی دەوروبەریشی. واتە: موساو فریشتەکان یان بە پێچەوانەوە، یان موساو چیای تور، جا پاکیو بێگەردی بۆ اَللَّهُ یە کە پەروەردگاری جیهانیانە.

(٩) ئینجا اَللَّهُ بانگی موسای کردو فەرموی: ئەی موسا ئەوە منم اَللَّهُ ی بە دەسەڵاتو کاربەجێ.

(١٠) عەساکەت فڕە بدە موساشعليه السلام وای کرد جا کاتێك بینی ئەگەر چی بەجەستەش گەورە بو، بەڵام هەروەکو مارێکی بچوك دەجوڵێت، لە ترسان پشتی تێکردو ئاوڕی لێ نەدایەوە، پەروەردگار بانگی موسای کردو فەرموی: ئەی موسا لەو مارە مەترسە بێگومان پێغەمبەران کاتێك کە لە لای منن لە هیچ شتێك نا بێ بترسن.

(١١) مەگەر ئەو کەسەی کە ستەمی کرد بێتو توشی خراپە بوو بێت، ئەوە دەبێت بترسێت لە تۆڵەی ئێمە بەڵام ئەویش ئەگەر لە پاشان ئەو خراپەیەی گۆڕی بێت بە چاکە، خۆ ئەویش با بزانێت بێگومان کە من لێبوردەو میهرەبانم.

(١٢) جا دەستیشت بخەرە باخەڵتەوە، کە دەردێت سپیە بە بێ ئەوەی عەیبێکی تێدا بێت، ئەمە دوو بەڵگەو نیشانن لەو نۆ بەڵگانەی کە پێتدراوە بۆ لای فیرعەونو گەلەکەی، بێگومان ئەوان گەلێکن لەخراپەو تاواندا لە سنور دەرچوون.

(١٣) جا کاتێك نیشانە ڕوونکەرەوکانی ئێمەیان پێگەیشت، لەجیاتی گوێ ڕایەڵی و گەردنکەچی وتیان: ئەمە جادوویەکی ڕوونە.

(١٤) لە ڕواڵەتدا دانیان بەڕاستی ئەو نیشانانەدا نەناو نکولیان لێکرد بەڵام دڵنیابون کە حەقو ڕاستن تەنها بەهۆی ستەمو لوت بەرزیەوە ئاوا دژایەتی موسایان دەکرد، دەسا تەماشا بکە سەرئەنجامی خراپەکاران چی لێهات، کە هەموویان بە نیوە ڕۆژێك خنکانو لە ناوچون، جا بابترسن لەدژایەتیکردنی محمدﷺ کە ئەو گەورەی پێغەمبەرانەو پەڕاوەکەیشی گەورەی پەڕاوانە، کەوا بو دژایەتی کردنیشی تاوانێکی گەورەترە لە تاوانی فیرعەونو گەلەکەی دەی دەبێت چاوەڕوانی سزای گەورەتر بکرێت بۆ تاونبارانی ئەم گەلە.

ئینجا پەروەردگار باسی هەندێ لەو چاکانەی خۆی دەکات کە داویەتی بەو دوو بەندە چاکەی خۆی کە داوودو سلێمان کوڕیەتیو دەفەرموێ:

وَجَحَدُوا۟ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا ۚ فَٱنظُرْ كَيْفَ
كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿١٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ وَسُلَيْمَـٰنَ عِلْمًا ۖ
وَقَالَا ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى فَضَّلَنَا عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّنْ عِبَادِهِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٥﴾
وَوَرِثَ سُلَيْمَـٰنُ دَاوُۥدَ ۖ وَقَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ ٱلطَّيْرِ
وَأُوتِينَا مِن كُلِّ شَىْءٍ ۖ إِنَّ هَـٰذَا لَهُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٦﴾ وَحُشِرَ
لِسُلَيْمَـٰنَ جُنُودُهُۥ مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ وَٱلطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ ﴿١٧﴾
حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَوْا۟ عَلَىٰ وَادِ ٱلنَّمْلِ قَالَتْ نَمْلَةٌ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمْلُ ٱدْخُلُوا۟
مَسَـٰكِنَكُمْ لَا يَحْطِمَنَّكُمْ سُلَيْمَـٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ
﴿١٨﴾ فَتَبَسَّمَ ضَاحِكًا مِّن قَوْلِهَا وَقَالَ رَبِّ أَوْزِعْنِىٓ أَنْ أَشْكُرَ
نِعْمَتَكَ ٱلَّتِىٓ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَىَّ وَأَنْ أَعْمَلَ صَـٰلِحًا
تَرْضَىٰهُ وَأَدْخِلْنِى بِرَحْمَتِكَ فِى عِبَادِكَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٩﴾
وَتَفَقَّدَ ٱلطَّيْرَ فَقَالَ مَا لِىَ لَآ أَرَى ٱلْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ
ٱلْغَآئِبِينَ ﴿٢٠﴾ لَأُعَذِّبَنَّهُۥ عَذَابًا شَدِيدًا أَوْ لَأَا۟ذْبَحَنَّهُۥٓ
أَوْ لَيَأْتِيَنِّى بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٢١﴾ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ
أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإٍۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾

﴿١٥﴾ بەڕاستی ئێمە زانیاریەکی گەورەمان دابو بە داودو سلێمان جا ئەوانیش وتیان: سوپاس هەر بۆ اللّٰه یە ئەو زاتەی کە ئێمەی بەرێزتر کردوە بەسەر زۆرێك لە بەندە باوەڕدارەکانیدا.

﴿١٦﴾ ئەوسا سلێمان بو بە جێ نشینی داوودی باوکیو زانست وپێغەمبەرایەتی لەو بە ئیرس برد، جا وتی: ئەی خەڵکینە ئێمە فێری قسەی باڵندە کراوینو وتووێژیان لەگەڵدا دەکەینو لێیان تێدەگەیین، خۆ هەمو شتێکیشمان پێدراوە بەڕاستی ئەمە هەر خۆی ڕێزێکی ئاشکرایە.

﴿١٧﴾ جا بۆ سلێمان سەربازەکانی لە جنۆکەو مرۆڤ و باڵندە کۆکرایەوە، ئەوسا ئەوان بە ڕێکوپێکی ریزکرانو لە بەردەم سلێماندا کە سوپایەکی گەورەو ڕێکوپێك بون دەبران.

﴿١٨﴾ هەتا گەیشتنە شیوی مێروله، جا لەو کاتەدا مێرولەیەك بانگی لە مێرولەکان کردو وتی: ئەی مێرولەکان بچنە ناو کونەکانتانەوە تا سلێمانو سەربازەکانی بە بێ ئەوەی هەست بکەن نەتان شکێنن بەیەکداو لەناوتان نەبەن.

بەڵێ ئەم مێرولەیە دڵسۆزی بۆ هاوشێوەکانی خۆی دەربڕیو نەیدەزانی سلێمان پێیان دەزانێت، بەڵام سلێمان ﵇ بانگەوازەکەی بیستو نیگەران بو لەوەی کە ئەو مێرولەیە ئەوانی بە بێ هەست ناوبردوە.

﴿١٩﴾ ئەوسا سلێمان ﵇ بە قسەکەی بزەی پێکەنینی هات و نەیویست سەرزەنشت یان تۆڵەی قسەکەی لێ وەربگرێت، بەڵکو ڕوی لە پەروەردگاری کردو وتی: ئەی پەروەردگارم رامم بکەو بۆم برەخسێنە بۆ ئەوەی بتوانم سوپاسی ئەو نیعمەتە گەورەیەت بکەم کە داوتە بە منو بە باوكو دایکم، وە وام لێ بکە کرداری چاکی وا بکەم کە تۆ پێی ڕازی بیت، وە بە سۆزو بەزەیی خۆت بمخەرە ناو بەندە چاکەکانتەوە.

﴿٢٠﴾ جاسەردانی باڵندەکانی کردو وتی: ئەوە چیە بۆ پەپو سلێمانە نابینم یان ئەو لێرە نیە؟ جا کاتێك بۆی دەرکەوت کە لەوێ نیە هەڕەشەی لێ کردو وتی:

﴿٢١﴾ دەبێت سزایەکی زۆر توندی بدەم یان سەری ببڕم، یان دەبێت بەڵگەیەکی ڕۆشنم بۆ بێنێت کە بێتاوانی لێرەنەبونی بسەلمێنێت.

﴿٢٢﴾ زۆری پێ نەچوو کە پەپو سلێمانە هاتەوە خزمەتی سلێمان﵇ جا وتی: من شتێکم دەستکەوتوە کەدەستی تۆ نەکەوتووەوپێت نەزانیوە ، خۆ من لە (سەبەئە) وە هەواڵێکی ڕاستو دروستم بۆ هێناوی.

﴿٢٣﴾ بێگومان من ژنێکم بینی کە پاشایەتی ئەو گەلە دەکاتو هەمو شتێکی پێدراوەو تەختێکی زۆر گەورەی هەیە.

﴿٢٤﴾ بینیم کە خۆیشیو گەلەکەیشی سوجدە بۆ خۆر دەبەن نە بۆ اللّٰه، جا شەیتان کردارە خراپەکانی بۆ جوان کردونو پێیان وایە لەسەر حەقن، خۆ بەوشیوەیە شەیتان ڕێگای ڕاستی لێ گرتوون، ئەوسا ئەوانیش ڕێگای ڕاستیان لێ ون بووە. جاپەپو بۆ ئەوەی گومانی خراپی پێ نەبرێت لۆمەی ئەو گەلە دەکاتودەڵێ:

﴿٢٥﴾ بۆ ئەوانە سوجدە نابەن بۆ ئەو اللّٰه یەی کە شاراوەکانی ناو ئاسمانانو زەوی دەردەهێنێت، وەبە وەی کە دەیشارنەوەو ئەوەیش کە ئاشکرای دەکەن دەزانێتو هیچ شتێك لەلای ئەو شاراوە نیە، چونکە هەموی دروستکراوی خۆیەتی؟!

﴿٢٦﴾ ئەو اللّٰه یەی کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەتر جگە لەو نیەو ئەو پەروەردگاری تەختی گەورەیە، دیارە ئەمانە قسەی پەپو سلێمانە بوون.

جا جێگای خۆیەتی کە کوشتنی ئەم باڵندەیە قەدەغەکراو بێت هەروەکو ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە کە:{نَهَى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَنْ قَتْلِ أَرْبَعٍ مِنْ الدَّوَابِّ النَّمْلَةِ وَالنَّحْلِ وَالْهُدْهُدِ وَالصُّرَدِ/ابوداود.صحححه الالباني /کە پێغەمبەرﷺ کوشتنی چوار جانەوەری قەدەغە کردوە مێرولەو مێش هەنگو پەپو سلێمانەو سورەد کە چۆلەکەیەکی سەر و دەنوك گەورەیە} پاش خوێندنەوەی ئەم ئایەتە سوجدەبردن سوننەتە.

(٢٧) سلێمان عليه السلام وتی: جاوا تەماشا دەکەین بزانین ئایا تۆ ڕاست دەکەیت یان لە درۆزنانی؟

(٢٨) ئەم نامەیەی من ببەو بیگەیەنە بەوان پاشان کەمێك لەوان دووربکەوە، جا تەماشا بکە بزانە چ ڕاوێژێك دەکەن. جا ئەویش نامەکەی بردو فڕەیی دایە لای پاشاکەیانو کاتێك نامەکەی خوێندەوە

(٢٩) وتی: ئەی پیاو ماقوڵانی دەربار بێگومان من نامەیەکی بەرێزم بۆ هاوێژراوە.

(٣٠) کە ئەو نامەش لە سلێمانەوەیە، کە نوسراوە بە ناوی اللّٰه یە کە زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبانە.

(٣١) قسەم ئەوەیە کە نابێت خۆتان بەسەر مندا بەرز بکەنەوە، جا بە گەردنکەچیو باوەڕداری وەرنە لام، ئەوسا پاش خوێندنەوەی دەقی ئەو نامەیە،

(٣٢) وتی: ئەی پیاوە بەرێزو ماقوڵەکان لە بارەی ئەم ئیشەی منەوە بڕیارم بۆ بدەن، چونکە خۆتان دەزانن باوی من وابوە کە بڕیاری تەواوی هیچ شتێك نادەم تا ئێوە لەلام ئامادە نەبنو پرسو ڕاتان پێ نەکەم، ئەوە کۆڕی ڕاوێژ یان پەرلەمانی ئەو ژنە پاشایە بو ئەمرۆش وا دەزانن هەر خۆیان لێزانو پێشکەوتون چونکە پەرلەمانیان هەیە؟!

(٣٣) بەڵێ پەرلەمانەکەی ئەو ئافرەتە یەکدەنگ وتیان: ئێمە خاوەنی هێزینو خاوەن زاتو زۆری توندینو ئامادەین بۆ شەڕ کردن بەڵام هەرچی بکەین بڕیار هەر بە دەست خۆتە، جا تەماشا بکەو بزانە چ بڕیارێك دەدەیت؟

(٣٤) وتی: بێگومان کە پادشایان هەر کاتێك بە زۆر چونە هەر وڵاتێکەوە ئەو وڵاتە تێكو پێك دەدەنو بەرێزەکانی سەرشۆڕ دەکەن، خۆ ئەوانیش هەر ئاوەها دەکەن.

إِنِّي وَجَدتُّ ٱمۡرَأَةٗ تَمۡلِكُهُمۡ وَأُوتِيَتۡ مِن كُلِّ شَيۡءٖ وَلَهَا عَرۡشٌ عَظِيمٞ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوۡمَهَا يَسۡجُدُونَ لِلشَّمۡسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمۡ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقۡتَ أَمۡ كُنتَ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ٱذۡهَب بِّكِتَٰبِي هَٰذَا فَأَلۡقِهۡ إِلَيۡهِمۡ ثُمَّ تَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَٱنظُرۡ مَاذَا يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ إِنِّيٓ أُلۡقِيَ إِلَيَّ كِتَٰبٞ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعۡلُواْ عَلَيَّ وَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَفۡتُونِي فِيٓ أَمۡرِي مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمۡرًا حَتَّىٰ تَشۡهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُواْ نَحۡنُ أُوْلُواْ قُوَّةٖ وَأُوْلُواْ بَأۡسٖ شَدِيدٖ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَيۡكِ فَٱنظُرِي مَاذَا تَأۡمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتۡ إِنَّ ٱلۡمُلُوكَ إِذَا دَخَلُواْ قَرۡيَةً أَفۡسَدُوهَا وَجَعَلُوٓاْ أَعِزَّةَ أَهۡلِهَآ أَذِلَّةٗۚ وَكَذَٰلِكَ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّي مُرۡسِلَةٌ إِلَيۡهِم بِهَدِيَّةٖ فَنَاظِرَةُۢ بِمَ يَرۡجِعُ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٣٥﴾

(٣٥) جا من خەڵاتێکی گەورەیان بۆ دەنێرم، ئەوسا چاوەڕێ دەکەم بزانم نێرراوەکان چۆن دەگەڕێنەوە، جا پەپو سلێمانە کە ئەم پرسو ڕایەی بیستو باسی خەڵاتەکەی زانی بە پەلە گەڕایەوە بۆ لای سلێمان.

(٣٦) جا کاتێك گەیشتە سلێمانو باسەکەی کردو خەڵاتەکە گەیشتە سلێمان عليه السلام وتی: بە ماڵو سامان دەتانەوێت لەگەڵ مندا بجوڵێنەوە لەسەر ئەوەی کە من واز لە ئێوە بهێنم کە هەروا لەسەر شیرکو کوفری خۆتان بمێننەوە؟ خۆ ئەوەی کە اللّٰه بە منی داوە لە پێغەمبەرایەتیو سەروەتو سامانو سەربازو هێز زۆر چاکترە لەوەی کە بە ئێوەی داوە لە ماڵی دنیا، بەڵکو ئێوەن کە بەو خەڵاتەی خۆتان دەنازنو پیتان وایە شتێکی گەورەیە ئیمە لەو جۆرە خەڵاتانە بێنیازین.

(٣٧) بگەڕێرەوە بۆ لایانو پێیان بڵێ: ئەوا ئێمە سەرباز گەلێکی وا دەهێنینە سەریان کە توانای ڕووبەڕوو بونەوەیان نەبێت، بێگومان لە وڵاتەکەیان بە سەرشۆڕی دەریان دەکەین لە کاتێکدا کەسوكو زەلیل بن، جا کاتێك ئەم هەڵوێستەی سلێمان گەیشتەوە پاشای (سەبە)، بڕیاری دا کە خۆیو گەلەکەی ملکەچو گوێڕایەڵی سلێمان بنو پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن.

فَلَمَّا جَآءَ سُلَيۡمَٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٖ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيۡرٞ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُمۚ بَلۡ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمۡ تَفۡرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرۡجِعۡ إِلَيۡهِمۡ فَلَنَأۡتِيَنَّهُم بِجُنُودٖ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخۡرِجَنَّهُم مِّنۡهَآ أَذِلَّةٗ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَؤُاْ أَيُّكُمۡ يَأۡتِينِي بِعَرۡشِهَا قَبۡلَ أَن يَأۡتُونِي مُسۡلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفۡرِيتٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَۖ وَإِنِّي عَلَيۡهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٞ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِي عِندَهُۥ عِلۡمٞ مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبۡلَ أَن يَرۡتَدَّ إِلَيۡكَ طَرۡفُكَۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسۡتَقِرًّا عِندَهُۥ قَالَ هَٰذَا مِن فَضۡلِ رَبِّي لِيَبۡلُوَنِيٓ ءَأَشۡكُرُ أَمۡ أَكۡفُرُۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشۡكُرُ لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ رَبِّي غَنِيّٞ كَرِيمٞ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُواْ لَهَا عَرۡشَهَا نَنظُرۡ أَتَهۡتَدِيٓ أَمۡ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهۡتَدُونَ ﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتۡ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرۡشُكِۖ قَالَتۡ كَأَنَّهُۥ هُوَۚ وَأُوتِينَا ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهَا وَكُنَّا مُسۡلِمِينَ ﴿٤٢﴾ وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعۡبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِۖ إِنَّهَا كَانَتۡ مِن قَوۡمٖ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدۡخُلِي ٱلصَّرۡحَۖ فَلَمَّا رَأَتۡهُ حَسِبَتۡهُ لُجَّةٗ وَكَشَفَتۡ عَن سَاقَيۡهَاۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرۡحٞ مُّمَرَّدٞ مِّن قَوَارِيرَۗ قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي ظَلَمۡتُ نَفۡسِي وَأَسۡلَمۡتُ مَعَ سُلَيۡمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾

﴿٣٨﴾ جا سلێمانیش ﵇ کاتێ کەئەم هەواڵەی زانی، وتی: ئەی بەڕێزانی دەربار کامتان دەتوانن پێش ئەوەی کە ئەو خۆی بە گەردنکەچی بێتە لام تەختی پاشاییەکەییم بۆ بهێنن؟ سلێمان لەو کاتەدا لە (قودس) بووەو ئەو ژنەش لە سەبەئی یەمەندا بوە.

﴿٣٩﴾ جنۆکەیەکی گەورەی بەهێز وتی: من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی لەم جێگایەی خۆت هەڵسیتو کۆڕەکەت بەجێ بهێڵیت، جا بێگومان من زۆر بەتواناو دەست پاکم لە سەر بەجێ هاوردنی ئەم ئەرکە، بەڵام سلێمان﵇ دەیویست زووتر بگاتە دەستی،

﴿٤٠﴾ بۆیە ئەو کەسەی کە هەندێك لە زانیاری ئەو پەڕاوە ڕەوانە کراوەی لەلا بو سنگی دەرپەڕاندو وتی: من پێش ئەوەی چاوت بتروکێنیت بۆت دەهێنم، بەڵێ ئەو کەسە کە هەندێك دەڵێن: ئاسەفی کوڕی بەرخیا، نوسەری سلێمان بو بە چاو تروکانێك ئەو تەختی پاشایەتییەی هێنا، جا کاتێك کە سلێمان بینی لەلای دانراوە وتی: ئەمە بەشێکە لە ڕێزەکانی پەروەردگارم بۆ من بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە کە ئایا سوپاسی دەکەم یان سپڵەو نمەك نەناسم، خۆ هەر کەسێك سوپاسی بکات سوپاسەکەی هەر بۆ خۆیەتیو خۆی پاداشتی ئەو سوپاسە وەردەگرێتەوەو هەر کەسێکیش سپڵەییو نا سوپاسی بکاتو چاکەی لەبەر چاو نەبێت، ئەویش هەروەها خۆی زیان لێ کەوتو دەبێت چونکە بەڕاستی پەروەردگارم بێنیازو سەخاوەتمەندە.

﴿٤١﴾ ئینجا سلێمان﵇ وتی: تەختەکەی بۆ بگۆڕن تا تەماشا بکەین بزانین دەیناسێتەوە یان لەوانەیە کەسەری لەبەر دەرناکاتو نایناسێتەوە.

﴿٤٢﴾ ئەوسا کە ئەو پاشا ئافرەتە هات پێی وترا: ئایا تەختەکەی تۆیش ئاوایە؟ وتی: ئەڵێی هەر ئەوە، وە ئەمەش لە ژیری ئەم ئافرەتە بو نەی وت: بەڵێ، ئەوەیە چونکە گۆڕانکاری تێدا کرابو، نەیوت ئەوەش نیە چونکە ناسییەوە، بۆیە وەڵامێکی دایەوە کە لە هەر دوو لاوە ڕاستە، جا سلێمان کاتێك ژیریو زیرەکی ئەو پاشا ئافرەتەی بۆ دەرکەوت وتی: ئێمە ناسینی هێزو دەسەڵاتی پەروەردگارمانو ڕێزی پێغەمبەرایەتیمان پێدراوە پێش ئەمەو ئێمە موسڵمانبوین.

﴿٤٣﴾ بەڵام بەندایەتی ئەو ئافرەتە بۆ جگە لە ﷲ ئەوی لەو حەقیقەتو ڕاستیە بەرگری کرد بو، بێگومان کە ئەو لە گرۆی خوانەناسان بو.

﴿٤٤﴾ پێی وترا بچۆ ناو ئەم کۆشکەوە جا کاتێك چاوی بە ڕێگای چونە ناو کۆشکەکە کەوت وای زانی ئەوە ئاوەو قاچی هەڵکرد، سلێمان وتی: ئەمە کۆشکێکی سافە لە شوشە دروستکراوە، جا ئەو ئافرەتە کە ئەم دەسەڵاتو هێزەی دی سەری سوڕماو جگە لەوەی کە سەری بەندایەتی بۆ ﷲ نەوی بکات هیچی تری بە دەستەوە نەماو وتی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لە خۆم کردوە بە پەرستنی جگە لە تۆ، وا ئیستا من لەگەڵ سلێماندا ملکەچی پەروەردگاری جیهانیانم.

ئینجا باسی گەلی صالحمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٤٥﴾ بەڕاستی بۆ گەلی (**سەمود**) صالحی برایانمان﵇ بۆ ناردن کە پێیان بڵێت: ﷲ بپەرستنو واز لە شیرك بهێنن، کەچی ئەوان بوون بە دوو دەستەوەو دژایەتی یەکتریان دەکرد هەندێکیان باوەڕیان پێکردو هەندێکیان بە درۆیان دەخستەوە.

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ فَإِذَا هُمْ فَرِيقَانِ يَخْتَصِمُونَ ﴿٤٥﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ لِمَ تَسْتَعْجِلُونَ بِٱلسَّيِّئَةِ قَبْلَ ٱلْحَسَنَةِ لَوْلَا تَسْتَغْفِرُونَ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٦﴾ قَالُوا۟ ٱطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ قَالَ طَٰٓئِرُكُمْ عِندَ ٱللَّهِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ ﴿٤٧﴾ وَكَانَ فِى ٱلْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿٤٨﴾ قَالُوا۟ تَقَاسَمُوا۟ بِٱللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُۥ وَأَهْلَهُۥ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِۦ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِۦ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٤٩﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٥٠﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ مَكْرِهِمْ أَنَّا دَمَّرْنَٰهُمْ وَقَوْمَهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥١﴾ فَتِلْكَ بُيُوتُهُمْ خَاوِيَةًۢ بِمَا ظَلَمُوٓا۟ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٥٢﴾ وَأَنجَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ وَأَنتُمْ تُبْصِرُونَ ﴿٥٤﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تَجْهَلُونَ ﴿٥٥﴾

(٤٦) وتی: ئەی گەلەکەم بۆ لەباتی داوای ڕەحمەتو سۆزی ﷲ بەپەلەن بۆ هاتنی سزای؟ دەی داوای لێخۆشبوون بکەن لە ﷲ بەڵکو بەزەیی پێتاندا بێتەوە.

(٤٧) وتیان: نەگبەتی ئێمە بەهۆی تۆو ئەوانەن لەگەڵ تۆدان وتی: ئەوەی کە دووچارتان دەبێت لە چاکو خراپ هەمووی بە فەرمانی خوایەو دەستی هیچ کەسی تێدا نیە، ئەوسا هەر خۆتان بەرپرسیارن لەو بارودۆخەی هەتانە، بەڵکو ئێوە گەلێکن کە بە چاکو بە خراپ تاقی دەکرێنەوە.

(٤٨) لەناو شاری (سەمود)دا نۆ پێرو تاقم هەبون کە هەر خەریکی خراپەکردنبون لەزەویداو هیچ چاکەیەکیان نەدەکرد، تا گەیشتنە ئەو ئاستەی کە بڕیاری کوشتنیسالْح ﷺبدەن.

(٤٩) بەیەکتریان وت: وەرن سوێند بخۆین بە ﷲ کە شەو بەیەکەوە هەمومان بدەین بەسەر ساڵح خۆیو خاو خێزانیداو بیانکوژین لە پاشان بۆ خاوەن خوێنی ساڵح سوێند بخۆین کە ئێمە لە کوشتنی ئەواندا دەستمان نیەو ئاگادارنین، خۆ ئێمە بێگومان ڕاست دەکەین . بەڵێ ئەو تاوانبارانە ئەو بڕیارە پڕ مەترسییەیان دژی ساڵح ﷺو خاو خێزانی داوو پێیان وابو کەئەو بونەوەرە بێخاوەنەو هەرچی ئارەزۆی لێ بکەن وا دەبێت؟! لەراستیدا ئەوە ڕەوشتی ستەمکارانە لە هەمو سەردەمێکداو دەیانەوێت هەمو شت هەر بە دەستو فەرمانی ئەوان بێتو پێچەوانەی ئارەزۆی ئەوان نابێت، جا ئەو نۆ پێرە ستەمکارەیش پاش کوشتنی وشترەکە ئەم بڕیارەیان دا بەڵام خوا شتێکی کرد کە ئەوان بە خەیاڵیاندا نەدەهات، دەفەرموێ:

(٥٠) خەریك بو کەتنێکی گەورە بکەن، ئەوسا ئێمەش کاری خۆمانمان لەگەڵدا کردن، ویستیان کەس نەزانێت ئەو ئیشە بکەن ئێمەش بە شێوەیەك بۆ ئەوان هاتین کە ئەوان ئاگایان لە خۆیان نەبو، جا بە دەنگێك لەناومان بردنو وەك دارو بەرد چەنو مل کەوتن.

(٥١) جا تەماشا بکەنو بزانن سەرئەنجامی کەتنەکەیان بو بە چی بێگومان ئێمە خۆیانو گەلەکەیانمان تێکڕا تارومار کردو لەناومان بردن.

(٥٢) ئەوە ماڵەکانی ئەوانە چۆڵو هۆڵو ڕوخاون بە هۆی ئەو ستەمەی کە کردیان، بێگومان لەمەدا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ گەلێك کە دەسەڵاتو هێزی ئێمە بزانن و پەندی لێوەربگرن.

(٥٣) خۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێنا بوو پارێزکار بون لەو سزایە ڕزگارمان کردن.

(٥٤) ئینجا بە کورتی داستانی (لووت) ﷺ باسدەکاتو دەفەرموێ: خۆلووتیشمان ﷺ نارد بۆ گەلەکەی، جا باس بکە ئەو کاتەی کە بە گەلەکەی وت: ئایا ئێوە ئەو ئیشە قێزەونو بەدڕەوشتیە ئەنجام دەدەن لە حاڵێکدا خۆیشتان بە ڕۆشنبیر دەزانن؟!

(٥٥) ئایا ئێوە دەچنە لای پیاوانو واز لە ژنان دەهێنن مەبەستان تەنها ئارەزۆ بازیە و هیچی تر؟ نەك هەر ئارەزۆ بازن بەڵکو ئێوە گەلێکی نەزانن.

(٥٦) جا وەڵامی ئەو گەلەی لووت ﷺ تەنها ئەوە بو کە بە یەکتریان دەوت: لووتو پەیڕەوانی لە شاری خۆتان دەربکەن، چونکە بێگومان کە ئەوان خەڵکێکن پاکو خاوێنیان دەوێت، واتە: هەر خۆیان ئەم ئیشەی خۆیان بە ناپوخت دەزانی، جا پاش

۞ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَخْرِجُوٓاْ ءَالَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَنجَيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَٰهَا مِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٥٧﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًاۖ فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٥٨﴾ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ وَسَلَٰمٌ عَلَىٰ عِبَادِهِ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَىٰٓۗ ءَآللَّهُ خَيْرٌ أَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٥٩﴾ أَمَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا بِهِۦ حَدَآئِقَ ذَاتَ بَهْجَةٍ مَّا كَانَ لَكُمْ أَن تُنۢبِتُواْ شَجَرَهَآۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ يَعْدِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَجَعَلَ خِلَٰلَهَآ أَنْهَٰرًا وَجَعَلَ لَهَا رَوَٰسِىَ وَجَعَلَ بَيْنَ ٱلْبَحْرَيْنِ حَاجِزًاۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَمَّن يَهْدِيكُمْ فِى ظُلُمَٰتِ ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَمَن يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ بُشْرًۢا بَيْنَ يَدَىْ رَحْمَتِهِۦٓۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِۚ تَعَٰلَى ٱللَّهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٣﴾

ئەوەی ئەم گەلەی لووت عليه السلام وازیان لەو تاوانە پیسو گەورەیە نەهێنا، خوای زاناو کاربەجێ بە سەروبن کردنو دەنگی گەورەو بەرد باران کردنیان لەناوی بردن وەك دەفەرموێ:

(٥٧) ئەوسا ئێمە لووت عليه السلامو خاو خێزانیمان ڕزگار کرد جگە لە ژنەکەی کە بڕیارمان دا بو بەهۆی پالپشتی کردنی لە ئەو خراپکارانە، لەناو ئەواندا بمێنێتەوەو رزگاری نەبێت.

(٥٨) جا بارانمان باراند بەسەریاندا چ بارانێك، بارانی بەردو سزا، ئای بارانی ترسێنراوان چەندە خراپە،

(٥٩) بڵێ: سوپاس هەر بۆ الله و سەلام لەو بەندانەی کە هەڵبژێراون، ئایا الله چاکە یان ئەوەی کە ئێوە دەیکەن بە هاوبەشی؟

(٦٠) یان ئەو کەسەی کە ئاسمانانو زەوی دروست کردووە لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوارەوە؟ جا باخچە گەلێکی خاوەن جوانیو بە ڕەونەقمان بەو ئاوە رواندوە کە ئێوە ناتوانن دارەکانیشی بڕوێنن، ئایا خودایەکی تر هەیە لەگەل اللهدا؟ نەخێر، ئەوان گەلێکن لە ڕێگایو بەرنامەی ڕاست لایان داوەو هاوتا بۆ الله دادەنێن.

(٦١) یان ئەو کەسەی کە زەوی ڕاگیرکردوەو ڕووبارەکانی لەناودا داناوەو چیاکانی بۆ ڕاگیرکردنی زەوی داناوەو لەنێوان ئەو دوو دەریا سوێرو شیرینەیشدا پەردەی داناوە کە تیکەڵاو نابن دەی ئایا خودایەکی تر هەیە لەگەل اللهدا کە دەستی لە دروستکردنی یەکێك لەو شتانەدا هەبێت؟ نەخێر نیە بەڵام زۆربەی ئەوان ئەم ڕاستیانە نازانن.

(٦٢) کێیە دێت بە هاواری یەك کەوتەیەکەوە هەر کاتێك بانگی بکاتو ئەو ناخۆشیەی کە بەسەریەوەیە لای ببات، وەبتانکات بە جێنشین لەم زەویەدا؟ ئایا خودایەکی تر هەیە لەگەل اللهدا کە یەکێك لەو شتانەتان بۆ بکات؟ ئەمانە کەم ئامۆژگاری وەردەگرن، جا ئایا ئەو کەسەی کە ئەوان دەیپەرستن چاکە یان ئەم زاتە فریادرەسو بە شکۆیە؟

(٦٣) یان کێیە ئەو کەسەی کە لەناو تاریکاییەکانی وشکانیو دەریادا ڕێنماییتان دەکات؟ وە یان ئەو کەسەی کە با ڕەوانە دەکات کە موژدەی بارانبارین پێش هاتنی باران دەدات؟ ئایا خودایەکی تر هەیە لەگەل اللهدا کە کارێك لەو کارانە بکات؟ الله زۆر بێنیازو بەرزترە لەو هاوبەشیەی کە ئەوان بۆی دادەنێن.

(٦٤) ئایا ئەوەی کە ئەوان دەیپەرستن چاکە یان ئەو زاتەی کە لە سەرەتادا دروستکراوەکانی دروستکردووەو لە پاش مردنیش دووبارە زیندویان دەکاتەوە؟ جا یان ئەو کەسەی کە لە ئاسمانو زەویدا ڕۆزیتان پێ دەدات؟ ئایا خودایەکی تر هەیە لەگەل اللهدا؟ بلێ: ئەگەر ڕاست دەکەن دەی بەلگەتان بهێنن؟

(٦٥) بلێ: جگە لە الله لە ئاسمانانو زەویدا هیچ کەسێکی تر نیە کە نهێنییوشاراوە بزانێت؟ خۆ هەستیش ناکەن کە کەی زیندوو دەکرێنەوە.

(٦٦) بەڵکو ئەوان وا قسەلە قیامەت دەکەن کە گوایە خۆیان لەو بارەوە گەیشتون بەو پەڕی زانیاریو پێویستیان بە پێغەمبەران نیە، نەخێر ئەوان لە بارەی قیامەتەوە لە گوماندان، بەڵکو ئەوان لەو ڕۆژە زۆر بێ ئاگانو چاوی بینینی ئەو ڕۆژەیان نیە.

(٦٧) خۆ ئەوانەی کە بێباوەڕبون، وتیان: ئایا ئێمەو باوباپیرانمان کە بوین بە خاك جارێکی تر بە زیندوی دەردەهێنرێینەوە؟

أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٦٤﴾ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱدَّٰرَكَ عِلۡمُهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِۚ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ مِّنۡهَاۖ بَلۡ هُم مِّنۡهَا عَمُونَ ﴿٦٦﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبٗا وَءَابَآؤُنَآ أَئِنَّا لَمُخۡرَجُونَ ﴿٦٧﴾ لَقَدۡ وُعِدۡنَا هَٰذَا نَحۡنُ وَءَابَآؤُنَا مِن قَبۡلُ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٦٨﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٦٩﴾ وَلَا تَحۡزَنۡ عَلَيۡهِمۡ وَلَا تَكُن فِي ضَيۡقٖ مِّمَّا يَمۡكُرُونَ ﴿٧٠﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٧١﴾ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ رَدِفَ لَكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي تَسۡتَعۡجِلُونَ ﴿٧٢﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٧٤﴾ وَمَا مِنۡ غَآئِبَةٖ فِي ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٍ ﴿٧٥﴾ إِنَّ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ يَقُصُّ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَكۡثَرَ ٱلَّذِي هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٧٦﴾

(٦٨) بەڕاستی لە پێشەوە باوباپیرانمانو ئێمەیش ئەم بەڵێنەمان پێدرا کە پاش مردن زیندو دەکرێینەوە کە ئەمە جگە لە داستانی هەڵبەسراوی پێشوان شتێکی تر نیە.

(٦٩) بڵێ: بە زەویدا بگەڕێن، جا تەماشا بکەنو بزانن سەرئەنجامی تاوانباران چۆن بووە چییان بەسەر هاتوە؟ ئینجا ﷲ دڵی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ دەداتەوەو دەفەرموێ:

(٧٠) جا خەم مەخۆ لەسەر خراپەو تاوانی ئەوانو خۆت دڵ تەنگ مەکە لەبەر ئەو فرو فێڵەی کە ئەنجامی دەدەن.

(٧١) خۆ دەڵێن: ئەگەر ڕاست دەکەن کەی ئەو بەڵێنە دێتە دی؟ کە سزامان بۆ بێت؟

(٧٢) بڵێ: لەوانەیە هەندێك لەو سزایەی کە ئێوە پەلەی بۆ دەکەن لێتان نزیك بوبێتەوە.

(٧٣) خۆ بێگومان کە پەروەردگارت خاوەن چاکەیە بەسەر خەڵکدا بەڵام زۆربەی ئەوان سوپاسی ﷲ ناکەن.

(٧٤) ئەوسا بێگومان پەروەردگارت بەوەی کە لە دڵیاندا شاردویانەتەوە دەزانێتو ئەوەیش کە ئاشکرای دەکەن.واتە: پەنهانیو ئاشکرایی لەلای ﷲ یەکسانەو وەك یەك دەیانزانێت.

(٧٥) هیچ شاراوەیەك لە ئاسمانو زەویدا نیە مەگەر لە پەڕاوی ڕۆشنکەرەوەدا تۆمار کرا بێت، واتە: ﷲ زانیاری بەسەر هەمو شتێکی نهێنیدا هەیەو پێش بونیشی لە (لەوحولمەحفوز) یشدا تۆماری کردوە، جا ئەگەر سزاتان بۆ نەهاتوە تا ئێستا مانای بێ ئاگایی ﷲ نیە بەڵکو لای ئەو کاتی نەهاتوە.

(٧٦) بێگومان ئەم قورئانە بۆ نەوەی ئیسرائیل زۆربەی ئەو شتانەی کە ناکۆکیان تێدا هەیە باسدەکات. وەك عیسا کە جولەکە بختیانی بۆ دەکەنو گاوریش زیادەڕەوی تێدا دەکەنو بە کوڕی خودا یان خودای سێیەمی دادەنێن.

(٧٧) جا بێگومان ئەم قورئانە ڕێنماییکەرو هۆی سۆزو خەیرە بۆ باوەڕداران.

(٧٨) بێگومان پەروەردگارت بە دادپەروەری خۆی لەنێوانیاندا بڕیار دەدات، خۆ ئەو هەر خۆیەتی بە توانایەو کەس ناتوانێت دژایەتی بکاتو لە دەستی دەرچێت، هەر خۆیشیەتی زۆر زاناو ئاگادار بەو شتانەی کە ناکۆکیان تێیدا هەبوە.

(٧٩) سا تۆ پشت بە ﷲ ببەستە بێگومان تۆ لەسەر حەقو ڕاستیەکی ئاشکرایت.

(٨٠) بێگومان کە تۆ ناتوانیت قسە بە مردوو ببیسێنیو ناتوانیت بە کەڕ هەر کاتێك پشتت تێ بکەنو بڕۆن قسە ببیسێنی.

(٨١) خۆ تۆ ناتوانیت بۆ کوێران ڕێنمونیکەر بیت تا لە گومڕایی ڕزگاریان بکەیتو بیانخەیتە سەر ڕێگای ڕاست، تۆ تەنها بەو کەسانە دەتوانیت ببیستێنی کە باوەڕ دەهێنن بە نیشانەکانمان، ئەوسا ئەوانیش موسڵمانن.

ئەم کافرانە کە دڵیان مردوەو گوێیان بۆ بیستنی حەق کەڕەو چاوی بینینی ئەو هەمو بەڵگە ڕۆنەیان نیە، جا ڕێگای حەقو ڕاستیان وا لێ ون بوە کەکەس ناتوانێت بیانخاتە سەر ڕێگای ڕاست. ئینجا پەروەردگار باسی یەکێك لە نیشانەکانی دوارۆژ دەکاتو دەفەرموێ:

وَإِنَّهُۥ لَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٧٧﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَقۡضِي بَيۡنَهُم بِحُكۡمِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٧٨﴾ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۖ إِنَّكَ عَلَى ٱلۡحَقِّ ٱلۡمُبِينِ ﴿٧٩﴾ إِنَّكَ لَا تُسۡمِعُ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَلَا تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوۡاْ مُدۡبِرِينَ ﴿٨٠﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَٰدِي ٱلۡعُمۡيِ عَن ضَلَٰلَتِهِمۡۖ إِن تُسۡمِعُ إِلَّا مَن يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُم مُّسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ ۞ وَإِذَا وَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِمۡ أَخۡرَجۡنَا لَهُمۡ دَآبَّةٗ مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ تُكَلِّمُهُمۡ أَنَّ ٱلنَّاسَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا لَا يُوقِنُونَ ﴿٨٢﴾ وَيَوۡمَ نَحۡشُرُ مِن كُلِّ أُمَّةٖ فَوۡجٗا مِّمَّن يُكَذِّبُ بِـَٔايَٰتِنَا فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿٨٣﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُو قَالَ أَكَذَّبۡتُم بِـَٔايَٰتِي وَلَمۡ تُحِيطُواْ بِهَا عِلۡمًا أَمَّاذَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨٤﴾ وَوَقَعَ ٱلۡقَوۡلُ عَلَيۡهِم بِمَا ظَلَمُواْ فَهُمۡ لَا يَنطِقُونَ ﴿٨٥﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا ٱلَّيۡلَ لِيَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٨٦﴾ وَيَوۡمَ يُنفَخُ فِي ٱلصُّورِ فَفَزِعَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۚ وَكُلٌّ أَتَوۡهُ دَٰخِرِينَ ﴿٨٧﴾ وَتَرَى ٱلۡجِبَالَ تَحۡسَبُهَا جَامِدَةٗ وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِۚ صُنۡعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِيٓ أَتۡقَنَ كُلَّ شَيۡءٍۚ إِنَّهُۥ خَبِيرُۢ بِمَا تَفۡعَلُونَ ﴿٨٨﴾

﴿٨٢﴾ جا هەر کاتێك ئەو بەڵێنە بەسەر ئەواندا هاتەجێ، لەم زەویەدا زیندەوەرێکیان بۆ دەردەهێنین کە قسەیان لەگەڵدا بکات و بڵێ: بەڕاستی خەڵك یەقینیان نیە بە نیشانەکانی ئێمە.

هاتنی ئەم زیندەوەرە یەکێکە لە نیشانەکانی هاتنی قیامەت، حوزەیفەی کوڕی ئەسید وتی: پێغەمبەرﷺ هاتە ژورێك کە ئێمە لەوێدا بووین و باسی هاتنی قیامەتمان دەکرد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:{إِنَّهَا لَنْ تَقُومَ حَتَّى تَرَوْنَ قَبْلَهَا عَشْرَ آيَاتٍ فَذَكَرَ الدُّخَانَ وَالدَّجَّالَ وَالدَّابَّةَ وَطُلُوعَ الشَّمْسِ مِنْ مَغْرِبِهَا وَنُزُولَ عِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَيَأَجُوجَ وَمَأْجُوجَ وَثَلَاثَةَ خُسُوفٍ خَسْفٌ بِالْمَشْرِقِ وَخَسْفٌ بِالْمَغْرِبِ وَخَسْفٌ بِجَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَآخِرُ ذَلِكَ نَارٌ تَخْرُجُ مِنْ الْيَمَنِ تَطْرُدُ النَّاسَ إِلَى مَحْشَرِهِمْ/ الطبراني، صححه الالباني/ قیامەت نایەت هەتا دە نیشانە نەبینن دوکەڵ، دەجال، زیندەوەرێك، ئەوەی کە لێرەدا باسی هاتوە، ڕۆژ هەڵهاتن لە ڕۆژئاواوە، دەرچوونی عیسای کوڕی مەریەم، دەرچوونی یأجوج و مأجوج، سێ بە ناخداچونی زەوی، بە ناخداچوونێك لە ڕۆژهەڵاتەوەو بە ناخداچوونێك لە ڕۆژئاواوە، وە بە ناخداچوونێك لە نیوە دوورگەی عەرەبدا، وە کۆتای ئەوانە ئاگرێکە لە لاخواروی (یەمەنە)وە دەردەچێت کە بەرەو مەحشەر خەڵك پاڵ دەنێت و کۆیان دەکاتەوە}

﴿٨٣﴾ جا باسی ڕۆژێك بکە کە ئێمە لە هەموو گەلێك پێرێك کۆ دەکەینەوە لەوانەی کە بێباوەڕن بە نیشانەکانی ئێمە جا ئەوان دواو بەریان دەدرێنە یەك و پاشان پاڵ دەدرێن.

﴿٨٤﴾ تا ئەو کاتەی کە دێنە جێگای پرسیارو وەڵام ﷲ بەوان دەفەرموێ: ئایا نکولیتان کرد لە نیشانەکانی ئێمەو باوەڕتان پێ نەکرد لە کاتێکدا کە ئێوە هیچتان لێ نەدەزانین؟ ئایا ئێوە سەبارەت بەو فەرمانانەی کەدامان بە سەرتاندا چیتان کرد؟

﴿٨٥﴾ خۆ بەهۆی ستەمکردنیانەوە ئەو سزایەی کەبەڵێنیان پێدرابو هاتە سەریان‌وگرتنی ، جا ئیتر ئەوان نقەیان لێ بڕاوەو دەنگیان لێوەنایەت‌و ناتوانن هیچ بڵێن.

﴿٨٦﴾ ئایا نابینن کە ئێمە شەومان داناوە بۆیان تا لەناویدا بحەسێنەوەو ڕۆژیشمان کردوە بە ڕۆشنکەرەوە بۆ کارو کۆشش؟ بێگومان لەمەدا چەندین نیشانە هەیە لەسەر دەسەڵات‌و سۆزو بەزەیی ﷲ بۆ گەلێ کە باوەڕ دەکەن بەڕاست‌ودروستی ئەم پەیامە.

ئینجا پەروەردگار باسی چۆنیەتی هاتنی قیامەت بە کورتی دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٨٧﴾ ئەو ڕۆژەی کە لەلایەن ئیسرافیلەوە فوو بە کەڵەشاخدا دەکرێت، جا ئەوەی لەناو ئاسمانان‌و ئەوەی لەناو زەویدایە هەمویان ترسان‌و مردن، جگە لەوەی کە ﷲ ویستی لە سەر ژیانی بو وەکو جبرەئیل‌و میکائیل‌و ئیسرافیل‌و فریشتەی مەئموری مراندن،

ئیبنو عەباس دەڵێت: ئەوانەی کە نامرن شەهیدانن کە لەلای پەروەردگاری خۆیان زیندون‌و ڕۆزیان پێدەدرێت. ئەوسا هەمو زیندەوەرێك لەپاش زیندوبونەوەی لە ڕۆژی قیامەت دا دێنە بەردەم دادگای ﷲ بە ترس‌و لەرزەوە، بەچاك‌و خراپەوە.

﴿٨٨﴾ جا تۆ لەو کاتەدا چیاکان دەبینی پێت وایە کە ئەوان وەستاون‌و هیچ جوڵەیەکیان نیە لە کاتێکدا کە ئەوان هەروەکو هەور هاتوچۆ دەکەن تا بە ڕێزاڵ ڕێزاڵی دەکەونە سەر زەوی، پاشان وەکو خوری شیکراوەیان لێ دێت‌و دواتریش دەبن بە تۆزو بڵاو دەبنەوەو هەمو چاڵ‌و چۆڵیەکانی زەوییان پێ ساف دەکرێت. ئەمەیە دروستکراوی ﷲ ئەو زاتەی کە هەمو شتێکی

تەواوو ڕێكو پێك كردوە، بێگومان ئەو زاتە زۆر بە ئاگایە بەوەی كە ئێوە دەیكەن.

(٨٩) هەر كەسێك چاكەیەك بكات ئەوسا لە لای پەروەردگاری پاداشتی باشتر لەوەی بۆ هەیە، جا ئەوان لە مەترسی ئەو ڕۆژەش بێ ترسن.

(٩٠) خۆ هەر كەسێكیش بە باری خراپەوە بێتە بەردەم دادگای ﷲ، ئەوسا بە سەر دەمو چاویدا دەخرێتە ناو ئاگرەوە، واتە: هەمو لەشی، بەڵام بۆیە ناوی دەمو چاو براوە، چونكە بەڕێزترین ئەندامی مرۆڤەو هەر پێنج هەستكەرەكەی بیستنو بینینو بۆنكردنو چەشتنو هەست بەساردیو گەرمیو زبری نەرمی كردنی پێوەیە، جا پێیان دەوترێت ئایا تۆڵەی هیچ شتێكتان لێ وەردەگیرێت جگە لە تۆڵەی ئەوكردارە خراپانەی كە كردوتانە؟ واتە: ستەمیان لێ ناكرێت و هەموكەس بەگوێرەی كردەی خۆی ڕەفتاری لەگەل دا دەكرێت.

ئینجا پەروەردگار بە پێغەمبەرەكەیﷺ فەرمان دەدات كە بڵێت:

(٩١) من تەنها فەرمانم بەوە پێكراوە كە پەروەردگاری ئەم شارەی كە هەمو خراپەیەكی تێدا قەدەغە كردوە، بپەرستم، خۆ هەمو شتێك هەر موڵكی ئەوەو خۆی خاوەنی ڕاستەقینەیەتیو فەرمانم پێكراوە كە من لە موسڵمانان بم.

(٩٢) خۆ فەرمانیشم پێكراوە كە ئەم قورئانە بخوێنمەوە، جا هەر كەسێك ڕێنمایی وەرگرت، ئەوە تەنها سوودی ئەو ڕێنماییەی بۆ خۆیەتی، وە هەركەسێكیش گومڕا ببێت ئەویش هەر زیانی لە خۆی داوە، جا پێیان بڵێ: من تەنها ترسێنەرێكم بۆ هەمو خەڵك جا هەر كەس باوەڕ دەكات خۆی قازانج دەكاتو هەركەسێكیش كە باوەڕ ناكات هەر خۆی ڕەنجەڕۆ دەبێت.

(٩٣) ئینجا بڵێ: سوپاس بۆ ﷲ كە هیچ كەسێك سزا نادات تا بەهانەی نەبڕێت، بەم زوانەش بەڵگەكانی خۆیتان پیشان دەدات، جا ئەو كاتە دەیناسن خۆ پەروەردگارت بێ ئاگا نیە لەوەی كە ئێوە دەیكەن.

## سورەتی قەصەص ٢٨ ٨٨

سورەتی قەصەص سورەتی بیستوهەشتەمی قورئانە، لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوە، هەشتاو هەشت ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چلونۆهەمەو پاش سورەتی (النمل)و پێش (الإسراء) دابەزیوە.

مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَا وَهُم مِّن فَزَعٖ يَوۡمَئِذٍ ءَامِنُونَ ﴿٨٩﴾ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَكُبَّتۡ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ هَلۡ تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَآ أُمِرۡتُ أَنۡ أَعۡبُدَ رَبَّ هَٰذِهِ ٱلۡبَلۡدَةِ ٱلَّذِي حَرَّمَهَا وَلَهُۥ كُلُّ شَيۡءٖۖ وَأُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٩١﴾ وَأَنۡ أَتۡلُوَاْ ٱلۡقُرۡءَانَۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهۡتَدِي لِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَقُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿٩٢﴾ وَقُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ فَتَعۡرِفُونَهَاۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ﴿٩٣﴾

## سُورَةُ القَصَصِ ٢٨ ٨٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) تا، سین، میم. ﷲ هەرخۆی دەزانێ چی مەبەستە.

(٢) ئەمە نیشانەكانی ئەم پەرتوكە ڕۆشنكەرەوەیە بۆ هەمو ئەوشتانەی كە بەندەكان پێویستیانە.

(٣) هەندێك لە بەسەرهاتی موساو فیرعەون بۆ مەبەستێكی ڕاستو دروست بەسەرتا دەخوێنینەوە تا ببێت بەپەندو ئامۆژگاری بۆ گەلێك كە باوەڕ دەهێنێت.

(٤) داستانەكەشی بەم شێوەیە كە: بێگومان فیرعەون زاڵبو بەسەر ناوچەی میسرداو لە خۆ بایی ببوو خەڵكی ئەو وڵاتەی كرد بە چەند بەشەوە. كەتاقمێك لەوان كە نەوەی ئیسرائیل بوون لاواز دەكات، كە كوڕەكانیان سەر دەبڕێتو واز لە كچەكانیان دەهێنێت بۆ خزمەت پێكردنو پێ ڕابواردنیان بەڕاستی ئەو لە خراپە كێڵان بو.

بەڵێ بەش بەشی هەر گەلو هۆزو ماڵێك هۆی لەناوچونی ئەو گەلو هۆزو ماڵەیەو ستەمكاران لە كۆنەوە ئەو سیاسەتەیان پەیڕەو كردوە، چونكە وانەبێ تونای زاڵبونیان بەسەرخەڵكدا نیەوناتوانن خۆیان بسەپێننوخەیروبەیری وڵاتیان لەدەس دەربهێنن، دیكتاتۆری بەناو دیموكراتیان بۆ ناچێتە سەر! قسەیەكی بەناوبانگیانە كە "فَرِّقْ تَسُدْ/ واتە: بەش بەشی دروست

وَنُمَكِّنَ لَهُمْ فِي ٱلْأَرْضِ وَنُرِيَ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَحْذَرُونَ ﴿٦﴾ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِي ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحْزَنِيٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّي وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ وَأَصْبَحَ فُؤَادُ أُمِّ مُوسَىٰ فَـٰرِغًا ۖ إِن كَادَتْ لَتُبْدِي بِهِۦ لَوْلَآ أَن رَّبَطْنَا عَلَىٰ قَلْبِهَا لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَتْ لِأُخْتِهِۦ قُصِّيهِ ۖ فَبَصُرَتْ بِهِۦ عَن جُنُبٍ وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿١١﴾ ۞ وَحَرَّمْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَرَاضِعَ مِن قَبْلُ فَقَالَتْ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰٓ أَهْلِ بَيْتٍ يَكْفُلُونَهُۥ لَكُمْ وَهُمْ لَهُۥ نَـٰصِحُونَ ﴿١٢﴾ فَرَدَدْنَـٰهُ إِلَىٰٓ أُمِّهِۦ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَلِتَعْلَمَ أَنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣﴾

بکە دەبێت بە گەورە" هەر بۆیە ئیسلامیش بە پێچەوانەوە بۆ بەهێز بونی گەل‌و نەتەوە داوای یەك دەستی‌و یەك دڵی‌و یەك پارچەیی دەكات‌و بێزارە لەدووبەرەكی‌وبەش بەشی‌و خۆسەپاندن.

﴿٥﴾ جا ئێمە دەمانەوێت منەت بخەینە سەر ئەو كەسانەی كە لەناو زەویدا بێدەستو لاوازكراون، واتە: نەوەی ئیسرائیل، وە بیانكەین بە پێشەواو بیانكەین بە جێ نشینی ئەو گەلە ستەمكارە تا دەركەوێت كە ئەوانیش چۆن رەفتار دەكەن.

﴿٦﴾ ئەوسا لەو زەوی میسردا جێگیرو بەهێزیان بكەین، جا پیشانی فیرعەون‌و هامان‌و سەربازەكانیا بدەین ئەوەی كە ئەوان لێی دەترسان كە لە ناوچونیان بو بە دەستی پیاوێك لە نەوەی ئیسرائیل. جا دایكی موسامان تێگەیاند كە شیری بدەرێ‌و هەر كاتێك لێی ترسایت كە پێی بزانن ئەو كاتە فڕەیی بدە ناو دەریای نیلەوە.

﴿٧﴾ جا هیچ مەترسەو خەمیش مەخۆ چونكە بەڕاستی ئێمە دەیگەڕێنینەوە بۆ لای خۆت‌و دەیكەین بە یەكێك لە پێغەمبەران، جا دایكی موسا كاتێك ترسی بۆ پەیدا بو كۆرپەو جگەرگۆشەكەی خۆی هاوێشتە ناو دەریای (نیل)ەوە. ئەوسا ئالی فیرعەونیش لە ناو دەریای نیلدا دۆزیانەوەو هەڵیان گرتەوە، تا سەرەنجام ببێت بە دوژمن‌و هۆی داخو مەینەتیان.

﴿٨﴾ بۆیە ئاوا تۆڵەیان لێ دەكەینەوە، چونكە بێگومان فیرعەون‌و هامان‌و سەربازەكانیان تاوانبار بون، سەر ئەنجام لەسەر دەستی ئەو منالە هەموویان لەناوچون.

﴿٩﴾ وا دیارە كاتێ لەناو دەریادا دۆزیانەوە فیرعەون بڕیاری كوشتنی داوە، بەڵام ژنی فیرعەون وتی: چاو ڕۆشنكەرەوەیەكە بۆمن‌و بۆ تۆ، مەیكوژن بەڵكو سوودێكمان پێبدات یان بیكەین بە كوڕی خۆمان، خۆ ئەوان نەیاندەزانی كە كێیەو سەرئەنجامی ئەوان لەگەڵ ئەودا چی دەبێت.

﴿١٠﴾ جا دایكی موسا پاش فڕەدانی ئەو كۆرپەیە هۆشی لا نەماو هەر لە بیری موسای كوڕیدا بو بەڕاستی نزیكبو ئەم بەسەرهاتە بدركێنێت ئەگەر ئێمە دڵمان بتەوو سەقامگیر نەكردایە، تا بەم شێوەیە ببێت بە یەكێك لە باوەڕداران بە هاتنەدی بەڵێنەكانی ﷲ، تەنانەت ئەوەندە بێ تاقەتی بو كچێكی نارد كە دوور بەدووری بڕوات‌و ئاگای لێ بێت.

﴿١١﴾ جا بەو خوشكەی موسای وت: پێ بە پێ بەدوایدا بڕۆو چاوت لێی بێت لە دوورەوە بە شێوەیەك كە ئەوان هەستت پێ نەكەن، جا ﷲ چۆنیەتی گەڕانەوەكەیمان بۆ باسدەكات‌و دەفەرموێ:

﴿١٢﴾ئەوسا مەمكی هەمو شیردەرێكمان لەو منداڵە قەدەغە كرد پێش ئەوەی بێتەوە لای دایكی، جا خوشكەكەی لێی چوە پێشەوەو بە دەستو پێوەندی فیرعەونی وت: ئایا دەتانەوێت ماڵێكتان پێ نیشان بدەم كە بەخێوی بكات بۆتان‌و چاودێریكەرێكی باشیشبێ بۆی؟ جا ئەوانیش پاش لێكۆڵینەوەیەك ناردیان بە شوێن ئەو شیردەرەدا كە دایكی خۆی بو، ئەوسا ئەویش هات‌و كاتێك گرتیە باوەشی‌و مەمكی پێدا مەمكەكەی گرت، دیارە پاش لێكۆڵینەوەیەكیش لەو ڕازی بوون كە لە ماڵی فیرعەوندا مەمكی پێ بدات بەڵام ئەو ئافرەتە ڕازی نەبو مێردو ماڵی خۆی بەجێ بهێڵێت‌و وتی: پێم خۆشە لە ماڵی خۆمدا مەمكی پێ بدەم ئەوانیش چونكە كەسێكی تریان دەست نەكەوت كە ئەو منداڵە مەمكی بگرێت دایەنە دەستی.

(١٣) جا ئێمە گەڕاندمانەوە بۆ لای دایکی تا چاوی بەو ڕۆشن ببێتەوەوخەم نەخوات، وە تا بیشزانێت کە بێگومان بەڵێنی اللّٰه ڕاستەو دێتە دی بەڵام زۆربەی ئەوان نازانن کە حەقو ڕاستی کامەیە، ئەو منداڵە تا گەورە بو لەناو ئاسایشو خۆشی لە لای ماڵی خۆی ژیانی بە سەر برد، جا کاتێك لە شیر بڕایەوە هاتەوە ناو خێزانی فیرعەونو بە خۆشیو شادمانی دەژیا.

(١٤) جا کاتێك بەهێز بو، وەبوبە گەنجێکی تەواو ئێمە داناییو زانایيمان پێدا، خۆ هەر ئاوەها پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

(١٥) جا لەو کاتەی کە شار قەرەباڵغ نەبوە چووەتە ناو شارەوە بینی لەناو شاردا دوو پیاو شەڕیانە یەکێکیان لە ڕەگەزی خۆیو ئەوەی تریان لە ڕەگەزی دوژمنەکانی بو، جا ئەوەی کە لە ڕەگەزی خۆی بو داوای یارمەتی لە موسا کرد دژی ئەوەی کە لە دوژمنانی بو، ئەوسا موسایش مشتە کۆڵەیەکی پیدا کیشا و کابرای کوشت بە بێ ئەوەی مەبەستی کوشتنی هەبێت، موسا وتی: ئەمە لە کرداری شەیتان بو بێگومان ئەو دوژمنێکی گومڕاکەری ئاشکرایە.

(١٦) وتی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من ستەمم لە خۆم کرد دەسا لێم ببورە جا پەروەردگاری چاوپۆشی لێکرد، بەڕاستی ئەو زۆر لێبوردەو بە بەزەییە.

(١٧) وتی: ئەی پەروەردگارم لە بەرامبەر ئەو نیعمەتەی بە منت داوە بەڵێن بێت منیش هەرگیز نەبم بە پاڵپشتی تاوانبار.

(١٨) ئیتر لەناو شاردا دەترساو چاوەڕێی ڕوودانی شتی دەکرد لەسەر کابرای کوژراو، جا لەو کاتەی کە بەناو شاردا دەگەڕا کەچی ئەو پیاوەی کە دوێنێ یارمەتی داو لەسەر ئەو، ئەو پیاوەی کوشت دیسان هاواری بۆ هێنایەوە کە لەگەل یەکێکی تردا بە دەمەقاڵە هاتبو موسایش پێی وت: بەڕاستی تۆ شەڕ فرۆشێکی ئاشکرای.

(١٩) جا کاتێك کە ویستی لەو کەسە بدات کە دوژمنی هەردووکیان بو، کابرای شەڕ فرۆش وای زانی موسا دەیەوێت لەو بدات بەهۆی قسەکەیەوە کە پێی وتبو: تۆ شەڕ فرۆشی. وتی:

وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَٱسْتَوَىٰٓ ءَاتَيْنَٰهُ حُكْمًا وَعِلْمًا ۚ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ (١٤) وَدَخَلَ ٱلْمَدِينَةَ عَلَىٰ حِينِ غَفْلَةٍ مِّنْ أَهْلِهَا فَوَجَدَ فِيهَا رَجُلَيْنِ يَقْتَتِلَانِ هَٰذَا مِن شِيعَتِهِۦ وَهَٰذَا مِنْ عَدُوِّهِۦ ۖ فَٱسْتَغَٰثَهُ ٱلَّذِى مِن شِيعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِى مِنْ عَدُوِّهِۦ فَوَكَزَهُۥ مُوسَىٰ فَقَضَىٰ عَلَيْهِ ۖ قَالَ هَٰذَا مِنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۖ إِنَّهُۥ عَدُوٌّ مُّضِلٌّ مُّبِينٌ (١٥) قَالَ رَبِّ إِنِّى ظَلَمْتُ نَفْسِى فَٱغْفِرْ لِى فَغَفَرَ لَهُۥٓ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ (١٦) قَالَ رَبِّ بِمَآ أَنْعَمْتَ عَلَىَّ فَلَنْ أَكُونَ ظَهِيرًا لِّلْمُجْرِمِينَ (١٧) فَأَصْبَحَ فِى ٱلْمَدِينَةِ خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ فَإِذَا ٱلَّذِى ٱسْتَنصَرَهُۥ بِٱلْأَمْسِ يَسْتَصْرِخُهُۥ ۚ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰٓ إِنَّكَ لَغَوِىٌّ مُّبِينٌ (١٨) فَلَمَّآ أَنْ أَرَادَ أَن يَبْطِشَ بِٱلَّذِى هُوَ عَدُوٌّ لَّهُمَا قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ أَتُرِيدُ أَن تَقْتُلَنِى كَمَا قَتَلْتَ نَفْسًۢا بِٱلْأَمْسِ ۖ إِن تُرِيدُ إِلَّآ أَن تَكُونَ جَبَّارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا تُرِيدُ أَن تَكُونَ مِنَ ٱلْمُصْلِحِينَ (١٩) وَجَآءَ رَجُلٌ مِّنْ أَقْصَا ٱلْمَدِينَةِ يَسْعَىٰ قَالَ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ ٱلْمَلَأَ يَأْتَمِرُونَ بِكَ لِيَقْتُلُوكَ فَٱخْرُجْ إِنِّى لَكَ مِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ (٢٠) فَخَرَجَ مِنْهَا خَآئِفًا يَتَرَقَّبُ ۖ قَالَ رَبِّ نَجِّنِى مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ (٢١)

ئەی موسا تۆ دەتەوێ بمکوژیت وەکو دوێنێ کەسێکی ترت کوشت؟ تۆ دەتەوێت ملهوڕێك بیت لەم زەویەداو ناتەوێ لە ئاشتیخوازان بیت، جا ئەم هەواڵە گەیشتەوە فیرعەون کە کوژرانی پیاوەکەی دوێنێ بە دەست موسا بوە، بۆیە زۆر ڕقی هەستاو بڕیاری کوشتنی داو ناردی بە شوێنیدا.

(٢٠) جا پیاوێك لەو سەری شارەوە بە هەڵەدوان هاتو وتی: ئەی موسا بەڕاستی پیاوانی دەربار خەریکی پیلان نانەوەو ڕاوێژن بۆ ئەوەی کە بتکوژن، جا زوو لێرە دەرچوە بێگومان کە من ئامۆژگاریکەرێکی دڵسۆزم بۆت.

(٢١) جا ئەویش لەو شارە بە ترسەوە بەوریاییەوە کە نەك دوچاری شتێ ببێت دەرچوو ، ئەوسا وتی: ئەی پەروەردگارم لەم گەلە ستەمکارە ڕزگارم بکە.

(٢٢) خۆ لە کاتێکیشدا کە ڕووی کردە (مەدیەن) وتی: نزیکە کە پەروەردگارم ڕێنماییم بکات بۆ سەر ڕێگای ڕاست. واتە: لە ڕەحمو میهرەبانی خوا نائومێد نەبو.

وَلَمَّا تَوَجَّهَ تِلۡقَآءَ مَدۡيَنَ قَالَ عَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يَهۡدِيَنِي سَوَآءَ
ٱلسَّبِيلِ ﴿٢٢﴾ وَلَمَّا وَرَدَ مَآءَ مَدۡيَنَ وَجَدَ عَلَيۡهِ أُمَّةٗ مِّنَ
ٱلنَّاسِ يَسۡقُونَ وَوَجَدَ مِن دُونِهِمُ ٱمۡرَأَتَيۡنِ تَذُودَانِۖ
قَالَ مَا خَطۡبُكُمَاۖ قَالَتَا لَا نَسۡقِي حَتَّىٰ يُصۡدِرَ ٱلرِّعَآءُۖ وَأَبُونَا
شَيۡخٞ كَبِيرٞ ﴿٢٣﴾ فَسَقَىٰ لَهُمَا ثُمَّ تَوَلَّىٰٓ إِلَى ٱلظِّلِّ فَقَالَ
رَبِّ إِنِّي لِمَآ أَنزَلۡتَ إِلَيَّ مِنۡ خَيۡرٖ فَقِيرٞ ﴿٢٤﴾ فَجَآءَتۡهُ إِحۡدَىٰهُمَا
تَمۡشِي عَلَى ٱسۡتِحۡيَآءٖ قَالَتۡ إِنَّ أَبِي يَدۡعُوكَ لِيَجۡزِيَكَ
أَجۡرَ مَا سَقَيۡتَ لَنَاۚ فَلَمَّا جَآءَهُۥ وَقَصَّ عَلَيۡهِ ٱلۡقَصَصَ قَالَ
لَا تَخَفۡۖ نَجَوۡتَ مِنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا
يَٰٓأَبَتِ ٱسۡتَـٔۡجِرۡهُۖ إِنَّ خَيۡرَ مَنِ ٱسۡتَـٔۡجَرۡتَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡأَمِينُ
﴿٢٦﴾ قَالَ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَنۡ أُنكِحَكَ إِحۡدَى ٱبۡنَتَيَّ هَٰتَيۡنِ عَلَىٰٓ أَن
تَأۡجُرَنِي ثَمَٰنِيَ حِجَجٖۖ فَإِنۡ أَتۡمَمۡتَ عَشۡرٗا فَمِنۡ عِندِكَۖ
وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أَشُقَّ عَلَيۡكَۚ سَتَجِدُنِيٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ قَالَ ذَٰلِكَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَۖ أَيَّمَا ٱلۡأَجَلَيۡنِ
قَضَيۡتُ فَلَا عُدۡوَٰنَ عَلَيَّۖ وَٱللَّهُ عَلَىٰ مَا نَقُولُ وَكِيلٞ ﴿٢٨﴾

(٢٣) جا لەو کاتەدا کە گەیشتە ئاوی مەدیەن بینی کە کۆمەڵێك لەو خەڵکە ئاو دەردەهێنن بۆ ئاودانی مەڕو ماڵاتەکانیانو دوو ئافرەتیشی بینی کە مەڕو ماڵاتی خۆیان دور دەخەنەوە لەو خەڵکە، جا موسا پێی وتن: ئەوە چیە ئێوە نایەنە ناوئەو خەڵکەوەو مەڕو ماڵاتی خۆتان ئاو بدەن؟ وتیان: ئێمە مەڕو ماڵاتمان ئاو نادەین تا ئەم شوانانە لەسەر ئاوەکە دەرنەچنو نەڕۆن، وە باوکی ئێمە پیرێکی گەورەیەو خۆی توانای ئەم ئیشەی نیە بۆیە ئێمەی ئافرت هەستاوین بەئەنجامدانی ئەم ئیشە.

(٢٤) جا موسا مەڕو ماڵاتەکەی بۆ ئاوادنو پاشان پشتی تێکردنو چووە ژێر سێبەرێكو دەستی بە ڕازو نیاز کرد لەگەڵ پەروەردگاری خۆی داو وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان من نیازمەندی هەر چاکەیەکم کە بۆم بنێریت.

(٢٥) جا یەکێك لەو دوو ئافرەتە بە حەیاو شەرمەوە ڕێی دەکرد هاتە لایو وتی: باوکم بانگت دەکات تا پاداشتی ئەو ئاودانەت بداتەوە، جا کاتێك هاتە لایو داستانەکەی خۆی بۆ باسکرد،پێی وت: مەترسە تۆ ئیتر لەو گەلە ستەمکارە ڕزگارت بووە.

(٢٦) یەکێك لەو دوو ئافرەتە وتی: ئەی باوکی خۆم بەکرێی بگرە بەڕاستی باشترین کەسێك کە تۆ بەکرێی بیگریت ئەم پیاوە بەهێزو دەستو دەم پاکەیە.

(٢٧) وتی: بێگومان من دەمەوێت یەکێك لەو دوو کچانەم مارە ببڕم لێت لەسەر ئەوەی کە هەشت ساڵ شوانیم بۆ بکەیت، جا ئەوسا ئەگەر ویستت دە ساڵ تەواو بکەیت پیاوەتییەکەو خۆت دەیکەیتو ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بێت من نامەوێت ئەزیەتت بدەم کە بەم زوانەش بۆت دەردەکەوێت کە من لەسەر ڕاستانم لە گەڵتا وهیچ بڕوبیانویەکت پێ ناگرم.

(٢٨) موسا وتی: ئەوە بڕیارێکە لەنێوان منو تۆدا ئەوسا کامیانم لەو دوو ماوەیە تەواوکرد با ناحەقیم پێ نەکرێت، ئەوسا ﷲیش شایەتە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین.

(٢٩) جا موسا ئەو ماوەیەی کە بڕیاریان لە سەر دابو تەواوکرد، ئەو کاتە بە شەو لەگەڵ خێزانو دەستو پێوەندی بەرەو میسر ڕۆیشتن لەرێگا لە کێوی (تور)ەوە ئاگرێکی بینیو پێی وتن: لێرەدا بوەستن من ئاگرێکم بەرچاو کەوت بەو هیوایەوە کە لە لای ئەو ئاگرە هەواڵێکی ڕێگاتان بۆ بهێنم یان دەستەوارەیەك لەو ئاگرەتان بۆ بهێنم بەڵکو خۆتانی پێ گەرم بکەنەوە.

(٣٠) جا کاتێك هاتە لای ئەو ئاگرەی کە بینیبوی، لەلای ڕاستی شیوەکەدا لەو پارچە پیرۆزەدا لەو درەختەوە بانگ کرا کە ئەی موسا بەڕاستی من ﷲم پەروەردگاری جیهانیان.

(٣١) دەی عەساکەت فڕەبدە جا کە فڕەیدا دی کە عەساکەی وەك مار دەجووڵێت موسا پشتی تێکردو ڕای کردو هیچ ئاوڕێکی بۆ نەدایەوە جا بانگ کرا: ئەی موسا بگەڕێرەوە بۆلایو مەترسە بەڕاستی تۆ لەو بێ ترسانەیت کە هیچ زیانیان پێ ناگات.

(٣٢) دەستت بخەرە باخەڵتەوە کە دەرت هێنا سپییەکی بێگەردە، وە بۆ نەمانی ئەو ترسە دەستی خۆت بخە سەر سینگت، جا فەرموی: ئەوە دوو بەڵگەن لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ

فیرعەون‌و ئەشرافیانی دەوروبەری بێگومان ئەوان لە خراپەو تاواندا گەلێکی لە سنور دەرچوون.

(٣٣) موسا وتی: ئەی پەروەردگارم بەڕاستی من یەکێکم لەوان کوشتووە دەترسم لەباتی ئەودا بمکوژنەوە،

(٣٤) خۆ هارونی برام لە من زمانی پاراوترە سا ئەویش لەگەڵ مندا ڕەوانە بکە کە پاڵپشتم بێت‌و قسەکانم بسەلمێنێت چونکە بێگومان من دەترسم کە ئەوان بە درۆم بخەنەوەوباوەڕم پێ نەکەن، جا کاتێك ئەم داوایەی کرد پەروەردگار وەڵامی دایەوە،

(٣٥) فەرموی: بەم زوانە بە هۆی براکەتەوە بەهێزت دەکەین‌و هیزێکی بتەوی واتان پێدەدەین کە توانایان نەبێت دەست درێژی بکەنە سەرتان، بڕۆن بۆ لای فیرعەون بەبەڵگەکانی ئێمە، بەدڵنیاییەوە ئێوەو ئەوانەی کە پەیڕەویتان دەکەن سەردەکەون.

(٣٦) جا لە کاتێکدا کە موسا بە بەڵگە ڕۆشنەکانی ئێمە هاتە لایان وتیان: ئەمە جگە لە جادویەکی هەڵبەستراو شتێکی تر نیە، خۆ ئێمە شتی وامان لەناو باوباپیرانی پێشوماندا نەبیستوە.

(٣٧) ئەوسا موسا وتی: پەروەردگارم باشتر دەزانێت بەو کەسەی کە بە ڕێنمایی لەلایەن ئەوەوە هاتوە، وە دەزانێت سەر ئەنجامی ئەو ماڵە خۆشەی قیامەت بۆ کێیە بێگومان بڕیاریش هەرئەوەیە کە ستەمکاران سەرکەوتو نابن.

(٣٨) جا فیرعەون وتی: ئەی بەرێزانی دەربار جگە لە خۆم هیچ خوایەکی تر شك نابەم بۆ ئێوە جا ئادەی هامان کەرپوچم بۆ دروست بکە، جا باڵەخانەیەکی بەرزم بۆ ساز بکە بەڵکو لەوێوە هەواڵێکی خوای موسا بزانم! خۆ بێگومان من پێم وایە کە موسا لە درۆزنانە.

(٣٩) ئەو خۆی‌و سەربازەکانی بە ناحەق لەم زەوییەدا خۆیان بە گەورە دەزانی و وایان گومان دەبرد کە ناگەڕێنرێنەوە بۆ لای ئێمە.

(٤٠) جا ئێمە خۆی‌و سەربازەکانیمان گرت‌و فڕێماندانە ناو دەریاوە تەنها لەنیو ڕۆژدا هەمویان خنکێنران. جا ئا لێرەدا تەماشا بکەن‌و وردببنەوە کە سەرئەنجامی ستەمکاران چۆن بو؟

﴿فَلَمَّا قَضَىٰ مُوسَى ٱلۡأَجَلَ وَسَارَ بِأَهۡلِهِۦٓ ءَانَسَ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ نَارٗاۖ قَالَ لِأَهۡلِهِ ٱمۡكُثُوٓاْ إِنِّيٓ ءَانَسۡتُ نَارٗا لَّعَلِّيٓ ءَاتِيكُم مِّنۡهَا بِخَبَرٍ أَوۡ جَذۡوَةٖ مِّنَ ٱلنَّارِ لَعَلَّكُمۡ تَصۡطَلُونَ ٢٩ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِيَ مِن شَٰطِيِٕ ٱلۡوَادِ ٱلۡأَيۡمَنِ فِي ٱلۡبُقۡعَةِ ٱلۡمُبَٰرَكَةِ مِنَ ٱلشَّجَرَةِ أَن يَٰمُوسَىٰٓ إِنِّيٓ أَنَا ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٣٠ وَأَنۡ أَلۡقِ عَصَاكَۚ فَلَمَّا رَءَاهَا تَهۡتَزُّ كَأَنَّهَا جَآنّٞ وَلَّىٰ مُدۡبِرٗا وَلَمۡ يُعَقِّبۡۚ يَٰمُوسَىٰٓ أَقۡبِلۡ وَلَا تَخَفۡۖ إِنَّكَ مِنَ ٱلۡأٓمِنِينَ ٣١ ٱسۡلُكۡ يَدَكَ فِي جَيۡبِكَ تَخۡرُجۡ بَيۡضَآءَ مِنۡ غَيۡرِ سُوٓءٖ وَٱضۡمُمۡ إِلَيۡكَ جَنَاحَكَ مِنَ ٱلرَّهۡبِۖ فَذَٰنِكَ بُرۡهَٰنَانِ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمٗا فَٰسِقِينَ ٣٢ قَالَ رَبِّ إِنِّي قَتَلۡتُ مِنۡهُمۡ نَفۡسٗا فَأَخَافُ أَن يَقۡتُلُونِ ٣٣ وَأَخِي هَٰرُونُ هُوَ أَفۡصَحُ مِنِّي لِسَانٗا فَأَرۡسِلۡهُ مَعِيَ رِدۡءٗا يُصَدِّقُنِيٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُكَذِّبُونِ ٣٤ قَالَ سَنَشُدُّ عَضُدَكَ بِأَخِيكَ وَنَجۡعَلُ لَكُمَا سُلۡطَٰنٗا فَلَا يَصِلُونَ إِلَيۡكُمَاۚ بِـَٔايَٰتِنَآ أَنتُمَا وَمَنِ ٱتَّبَعَكُمَا ٱلۡغَٰلِبُونَ ٣٥﴾

(٤١) ئەوسا ئەوانمان کرد بە پێشەوا کە بانگ بکەن ئەو کەسانەی کە دوایان دەکەون بۆ لای ئاگر، جا ڕۆژی قیامەتیش یارمەتی نادرێن. ئای لەو گاڵتە پێکردنە، تۆ لە دنیادا پێشەوا بیت بۆ بانگ کردنی خەڵك بۆ ناو ئاگر کەچی لە قیامەتیشدا کاتێك سزا دەدرێن هیچکەس بە هاناتانەوە نەیەت! ئەی کوا گەورەو پێشەواکەت کەگیان‌وماڵی خۆتت بۆ فیدا دەکرد؟

(٤٢) خۆ هەر لەم دنیادا نەفرینمان بەشوێن خستن‌و لە ڕۆژی قیامەتیشدا لە خوێنتاڵ‌و ڕووڕەشانن. ئینجا پەروەردگار باسی ئەو نیعمەتە گەورەی خۆی دەکات کە دای بە موسا پاش لەناوبردنی فیرعەون‌و دەفەرموێ:

(٤٣) پاش ئەوەی کە خەڵکانی پێش ئەوانمان لەناوبردن ئێمە تەوراتمان بە موسا دا کە چاو ڕۆشنکەرەوە بێت بۆ خەڵك‌و ڕێنمایکەرو بەرەکەتێك بێ تا بەڵکو ئەوانیش بیربکەنەوەو بەو هۆیەوە خۆشبەخت‌و چاوساغانە بژین. دیارە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ لەم ڕووداوو بە سەر هاتانە کەباسکرا لەپێشدا شتێکی نەدەزانی، بۆیە دەفەرموێ:

فَلَمَّا جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّفۡتَرٗى وَمَا سَمِعۡنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبِّيٓ أَعۡلَمُ بِمَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ مِنۡ عِندِهِۦ وَمَن تَكُونُ لَهُۥ عَٰقِبَةُ ٱلدَّارِۖ إِنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحٗا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ وَٱسۡتَكۡبَرَ هُوَ وَجُنُودُهُۥ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٠﴾ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ أَئِمَّةٗ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلنَّارِۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ وَأَتۡبَعۡنَٰهُمۡ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا لَعۡنَةٗۖ وَيَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ هُم مِّنَ ٱلۡمَقۡبُوحِينَ ﴿٤٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَهۡلَكۡنَا ٱلۡقُرُونَ ٱلۡأُولَىٰ بَصَآئِرَ لِلنَّاسِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٣﴾

(٤٤) خۆ تۆ لە تەنیشتی چەپی ئەو شیوە نەبویت کە ئێمە لەلای ڕاستیەوە وەحیمان کردە لای موساو لەوێش ئامادە نەبویت کە ئێستا ئەو بەسەر هاتانەیان بۆ بگێڕیتەوە.

(٤٥) بەڵکو ئێمە خەڵکی زۆرمان هێنایە سەر زەوی‌و تەمەنیشیان زۆر بو، جا کاتێك کە ئێمە تۆمان کرد بە پێغەمبەر خەڵك لەم باس‌و خواسە شتێکیان نەدەزانی جا تۆ لە ناو خەڵکی (**مەدیەن**)یشدا نەبویت کە موسا چوە ناویان‌و شوانی کردو ژنی هێناو گەڕایەوە، کەچی نیشانەکانی ئێمەیان بە سەردا دەخوێنیتەوەو باسی ئەو ڕوداوانەیان بۆ دەگێڕیتەوە بەڵکو ئێمەین ڕەوانەکەری پێغەمبەران‌و تێگەیەنەرو پێگەیەنەریان. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەکی گرنگە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی محمدی نەخوێندەوار ﷺ.

(٤٦) جا تۆ لەلای کێوی (تور)یش نەبویت کاتێك کە موسا هات‌و تەوراتی وەرگرت بەڵام ئەمە بەزەیی‌و سۆزێکە لەلایەن پەروەردگارتەوە تا تۆ گەلێك کە پێش تۆ هیچ ترسێنەرێکیان بۆ نەهاتوە لە سزای دواڕۆژ بترسێنی بەڵکو بیر بکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری وەربگرن.

(٤٧) جا ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کەئەگەر دوچاری سزایەك بەهۆی بەد ڕەفتاری خۆیانەوە ببونایە ئەوسا بڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەی تۆ بۆچی پێغەمبەرێکت بۆ ئێمە نەنارد تا پەیڕەوی نیشانەکانت بکەین‌و لەو کەسانە بین کە باوەڕدارن، سزامان زوو بۆدەناردن؟

(٤٨) جا کاتێك لەلایەن ئێمەوە بە ناردنی تۆ حەق‌و ڕاستیان پێگەیشت وتیان: دەبا وەکو ئەوەی کەدرا بە موسا بدرایە بە ئێمەش، جا پەروەردگار لە دەمیان دەداو دەفەرموێ: ئایا لە پێش ئەم قورئانەیشدا بێباوەڕ نەبون بەوەی کە درابو بە موسا، دەیان وت: موساو هارون دوو جادووگەرن‌و پاڵپشتی یەکترن‌و وتیان: ئێمە بێباوەڕین بە هەمویان.

ئیبنو کەسیر دەڵێت: بێ ملەجەڕە لەلای هەمو خاوەن عەقڵەکان زانراوە کە اللّٰه لە ئاسمانەوە لە ناو ئەو پەڕاوانەی کە ناردوویەتی بۆ پێغەمبەران تەواوترو هەمە لایەنە ترو ڕەوانترو گەورەترو بەرێزتری لەو پەڕاوەی کە ناردویەتی بۆ محمدﷺ کە قورئانە نەناردوە، وە پاش ئەو لە ڕێزو گەورەیەتیدا ئەو پەڕاوەیە کە ناردویەتی بۆ موسای کوڕی عیمران علیه السلام کە تەوراتە، خۆ ئینجیلی ڕەوانە کراوی لای عیسایش علیه السلام تەواکەری تەوراتەو حەڵاڵکەری هەندێك لەوانەیە کە لەسەر نەوەی ئیسرائیل (**یەعقوب**) حەرام کرا بو. بۆیە دەفەرموێ:

(٤٩) بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن لەلایەن اللّٰهوە پەڕاوێکم بۆ بهێنن کە چاکتر لەم دووانە (تەورات‌و قورئان) ڕێ پیشاندەرتر بێت منیش دوای دەکەوم‌و پەیڕەوی دەکەم.

(٥٠) ئەوسا ئەگەر وەڵامیان نەدایتەوەو پەیڕەوییان نەکردیت، دەی چاك بزانە کە ئەوان هەر پەیڕەوی ئارەزۆی خۆیان دەکەن‌و هیچ بەڵگەیەکیان نیە، جا کێیە گومڕاو سەر لێشێواوتر لەو کەسەی کە بەبێ ڕێنمایی لەلایەن اللّٰهوە پەیڕەوی لە ئارەزۆی خۆی بکات؟ ئەوانە بەڕاستی ستەمیان لە خۆیان کردوە، بێگومان کەاللّٰه گەلانی ستەمکار ناگەیەنێ بەسەرفەرازی‌و بەختەوەری.

(٥١) جا بەڕاستی ئێمە بێ پسانەوە ئەم پەندو ئامۆژگاریانەمان پێ وتن بەڵکو بیر بکەنەوە. ئینجا پەروەردگار باسی ئەو زاناو

پیاو چاکانەی ئەهلی کیتاب کە باوەڕیان هێنا بەم قورئان دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٢) ئەو کەسانەی کە لەپێش ئەم قورئانەدا پەڕاومان پێداون ئەوان بەم قورئانە باوەڕ دەهێنن.

(٥٣) جا هەر کاتێك ئەو قورئانە بەسەریاندا بخوێنرێتەوە دەڵێن: باوەڕمان پێیەتی بێگومان ئەوە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارمانەوەیە، بێگومان ئێمە پێش ئەم قورئانەیش هەر موسڵمان بوین.

ئەمەش ڕۆشنترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئایینی پێغەمبەران لە شتە بنچینەییەکاندا یەکن‌و لە یەك سەرچاوەوە هەڵقوڵاون، ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٥٤) ئەوانە بە هۆی خۆگرتنیان لەسەر ئایینی پێشوی خۆیان‌و پاشان باوەڕهێنانی ڕاستەقینەیان بەم قورئانە دوو بەرامبەر پاداشت دەدرێنەوە، وە ئەوانە بە چاکە خراپە لادەبەن‌و وەڵامی خراپە بە خراپە نادەنەوە، کە ئەمەش پلەیەکی هەرە بەرزە بۆ مرۆڤی خاوەن باوەڕو هەمو کەس بەوپلەیە ناگات، وە لەو سەروەت‌و سامانەش کە پێمان داون بەخەزمو بێگانە دەبەخشن چ بەشێوەی زەکات چ بە شێوەی چاکەی تر.

(٥٥) خۆ هەر کاتێك شتی بێ سوودو بێ کەڵك ببیسن پشتی تێدەکەن‌و دەڵێن: کرداری خۆمان بۆ خۆمان‌و کرداری خۆتان بۆ خۆتان، لە ئێمەوە تووشی زیان نابن، ئێمە نامانەوێت سەروکەللە لەگەڵ نەفام‌و نەزانانداا بدەین. دڵی باوەڕدار هەمیشە لە یادی پەروەردگاری خۆیدایەو نایەوێ خۆی بە شتی بێسودو پڕو پوچەوە سەرگەرم بکات. ئینجا پەروەردگار ڕوو دەکاتە پێغەمبەرﷺ و دەفەرموێ:

(٥٦) بێگومان کە تۆ ناتوانیت هەر کەسێکت خۆشویست بیخەیتە سەر ڕاستە ڕێگای ئایین بەڵام ﷲ هەر خۆیەتی کە ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت دەیخاتە سەر ڕیگای ڕاست، چونکە هەر ئەو زاتە دەزانێت کێ شایستەی ڕێنماییەو کێیش شایستەی گومڕایی. لە فەرمودەی ڕاستدا هاتوە کە ئەم ئایەتە سەبارەت بە ئەبو تالیبی مامی پێغەمبەرمان ﷺ دابەزیوە کە هەمیشە چاودێری پێغەمبەری ﷺ دەکردو خۆشی دەویست‌و لە ڕیزی ئەودا بو بەڵام

وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلْغَرْبِيِّ إِذْ قَضَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَى ٱلْأَمْرَ وَمَا كُنتَ مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٤٤﴾ وَلَٰكِنَّآ أَنشَأْنَا قُرُونًا فَتَطَاوَلَ عَلَيْهِمُ ٱلْعُمُرُ ۚ وَمَا كُنتَ ثَاوِيًا فِىٓ أَهْلِ مَدْيَنَ تَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا وَلَٰكِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٤٥﴾ وَمَا كُنتَ بِجَانِبِ ٱلطُّورِ إِذْ نَادَيْنَا وَلَٰكِن رَّحْمَةً مِّن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوْمًا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٍ مِّن قَبْلِكَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوْلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ فَيَقُولُوا۟ رَبَّنَا لَوْلَآ أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ وَنَكُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ فَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلْحَقُّ مِنْ عِندِنَا قَالُوا۟ لَوْلَآ أُوتِىَ مِثْلَ مَآ أُوتِىَ مُوسَىٰٓ ۚ أَوَلَمْ يَكْفُرُوا۟ بِمَآ أُوتِىَ مُوسَىٰ مِن قَبْلُ ۖ قَالُوا۟ سِحْرَانِ تَظَٰهَرَا وَقَالُوٓا۟ إِنَّا بِكُلٍّ كَٰفِرُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبٍ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ هُوَ أَهْدَىٰ مِنْهُمَآ أَتَّبِعْهُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤٩﴾ فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٠﴾

لەبەر خزمایەتی نەك لەبەر بیرو باوەڕ، جا کاتێك نزیکی مردن بوویەوە پێغەمبەرمانﷺ بانگی کرد بۆ وەرگرتنی ئەم ئایینە پیرۆزە، بەڵام ئەو لەبەر لۆمەی بت پەرستان شایەتومانی نەهێناو بە موشریکی مرد کە ئەمەش زۆر سەخت بو لەلای پێغەمبەرمانﷺ جا خوا ئەم ئایەتەی بۆ نارد. ئینجا پەروەردگار هەندێك لە بەهانەی ئەو بت پەرستانەی مەکە باسدەکات‌و دەفەرموێ:

(٥٧) جا ئەوان وتیان: ئەگەر ئێمە دوای ئەو ڕێنماییە بکەوین لەگەڵ تۆدا هەر لەم زەویەی خۆماندا پارچە پارچە دەکرێین! پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوان ئاوا دەڵێن، ئەی مەگەر ئێمە ئەوانمان لە شوێنێکی ئەمن‌و ئاسایشدا دانەمەزراندوە کە بەروبومی هەمو شتێکیان بۆ دەبرێت کە ئەوەش ڕۆزییەکە بۆیان لەلایەن ئێمەوە؟ بەڵام زۆربەی ئەوان ئەم ڕاستیانە نازانن‌و هەنگاوی کوێرانە هەڵدەگرن وەکو ئەوەی کە ئەوان خۆیان ئەو ڕێزو پلەیەیان بۆ خۆیان دابین کردبێت!

(٥٨) خۆ زۆر وڵاتیشمان لەناوبرد کە خەڵکەکەی بە هۆی ڕابواردن‌و ژیانی خۆشیانەوە سەرکەش‌و لەخۆبایی بون، جا ئەوە جێگاکانیانە ببینن کە لە پاش ئەوان جگە لە کەمێك لەوێدا

وَلَقَدْ وَصَّلْنَا لَهُمُ الْقَوْلَ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥١﴾ الَّذِينَ آتَيْنَاهُمُ الْكِتَابَ مِن قَبْلِهِ هُم بِهِ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ وَإِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ قَالُوا آمَنَّا بِهِ إِنَّهُ الْحَقُّ مِن رَّبِّنَا إِنَّا كُنَّا مِن قَبْلِهِ مُسْلِمِينَ ﴿٥٣﴾ أُولَٰئِكَ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُم مَّرَّتَيْنِ بِمَا صَبَرُوا وَيَدْرَءُونَ بِالْحَسَنَةِ السَّيِّئَةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِذَا سَمِعُوا اللَّغْوَ أَعْرَضُوا عَنْهُ وَقَالُوا لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ سَلَامٌ عَلَيْكُمْ لَا نَبْتَغِي الْجَاهِلِينَ ﴿٥٥﴾ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴿٥٦﴾ وَقَالُوا إِن نَّتَّبِعِ الْهُدَىٰ مَعَكَ نُتَخَطَّفْ مِنْ أَرْضِنَا أَوَلَمْ نُمَكِّن لَّهُمْ حَرَمًا آمِنًا يُجْبَىٰ إِلَيْهِ ثَمَرَاتُ كُلِّ شَيْءٍ رِّزْقًا مِّن لَّدُنَّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ بَطِرَتْ مَعِيشَتَهَا فَتِلْكَ مَسَاكِنُهُمْ لَمْ تُسْكَن مِّن بَعْدِهِمْ إِلَّا قَلِيلًا وَكُنَّا نَحْنُ الْوَارِثِينَ ﴿٥٨﴾ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا وَمَا كُنَّا مُهْلِكِي الْقُرَىٰ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَالِمُونَ ﴿٥٩﴾

نیشتەجێ نەبون ئەوسا ئێمە هەر خۆمانین دەمێنینەوەو خەڵك هەموی دەمرێت.

﴿٥٩﴾ خۆ پەروەردگاری تۆ هیچ شارێکی لەناو نەبردوە هەتا پەیامبەری خۆی نەناردبێتە ناو سەرەکی ترین جیگایانەوە کە نیشانەکانی ئێمەیان بەسەردا خوێندبنەوە تا هیچ بەهانەیەکیان نەبێت بۆ ڕۆژی قیامەت، جا ئێمە هیچ وڵاتێکیشمان لەناو نەبردوە، مەگەر لەبەر ئەوەبوە کە خەڵکەکەی ستەمکار بون.

﴿٦٠﴾ جا ئەوەی کە پێتاندراوە لە هەر شتێك تەنها لەزەتێکی ژیانی دنیایەو جوانیەکەیەتیو پاش ماوەیەکی کەم یان ئێوە لەو دەردەچن یان ئەو لەدەست ئێوە دەردەچێت، خۆ ئەوەی کە لەلای الله یە چاکترو زۆرتر دەمێنێتەوە، واتە: ئەم ژیانە فریودەرەو جێگای دڵنیاییو پشت پێ بەستنی نیە، دەی ئایاهەر تێناگەن؟

﴿٦١﴾ ئایا ئەو کەسەی کە ئێمە بەڵێنێکی جوانمان پێدابێت، جا ئەو بەو بەڵێنەش بگات وەك ئەو کەسە وایە کە ئێمە ڕابواردنێکی ژیانی دنیامان پێدابێتو زۆر نەبات لەناو بچێتو پاشان ئەو لە ڕۆژی قیامەتدا لەو کەسانە بێت لەناو ئاگردا ئامادە دەکرێن؟ نەخێر وەکو یەك نین.

﴿٦٢﴾ جا باس بکە بۆیان ئەو ڕۆژەی کە الله بانگیان دەکاتو ئەوسا دەفەرموێ: لەکوێن ئەو هاوبەشانەی من کە ئێوە واتان گومان دەبرد کە ئەوانە هاوبەشی منن‌و دەتوانن یارمەتیتان بدەن‌و تکاتان بۆ بکەن؟

﴿٦٣﴾ ئەو کەسانەی کە بڕیاری ئێمە بە سەریاندا هاتە دیو چوونە ناو ئاگرەوە دەڵێن: ئەمانە ئەو کەسانەن کە ئێمە سەرمان لێتێکدان، سەرمان لێتێکدان هەروەکو چۆن خۆمان سەرمان لێ شێوابو لە پێشگای تۆدا بێزاری خۆمان لەوان دەردەبڕین، ئەوان ئێمەیان نەپەرستوە بەڵکو هەواو ئارەزۆو بەرژەوەندی خۆیانیان ویستوە، ئائەوەیە سەرئەنجامی عابیدان‌و مەعبودانی ساختەیی.

﴿٦٤﴾ جا بە پەیڕەوان وترا بانگ بکەنە ئەو هاوبەشانەی کە بۆ الله تان دانا بو با بێن بە دەمتانەوەو پارێزگاریتان لێ بکەن، جا ئەوانیش بانگیان کردن بەڵام وەڵامیان نەدانەوە، جا نەك لەبەر شەهامەتو لێهاتویی بەڵکو لەبەر ترسنۆکی‌و سەرگەرمی بە سزای خۆیانەوە، جا چاویان بە سزا دەکەوێت، بێگومان ئەگەر ئەوان ڕێگای هیدایەتیان بگرتایە خۆ ئێستا ئەو سزایەیان نەدەدی.

﴿٦٥﴾ جا باس بکە بۆیان ئەو ڕۆژە کە الله بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: چۆن وەڵامی پێغەمبەرانتان دایەوە؟

﴿٦٦﴾ جا لەو ڕۆژەدا هەمو هەواڵێکیان لە بیر دەچێتەوەو هیچ بەڵگەیەکی ڕاستو دروستیان نیە بۆ وەڵامدانەوە، جگە لە شەرمەزاری‌و سەرشۆڕی، ئەوسا پرسیار لە یەکتر ناکەن بۆ وەڵام دانەوەی ئەم پرسیارە، جا لە ترسی ڕوداوی پڕ مەترسی ئەو ڕۆژە سەختە پاش زەمانێکی درێژ دێنە قسەو سوێندی درۆ دەخۆن وەك لە ئایەتی بیستوسێی سورەتی ئەنعامدا هاتووە دەڵێن: ﴿ بە الله قەسەم ، بە پەروەردگارمان ئێمە موشریك نەبووین ﴾

ئەگەر بە جوانی لە ڕۆژی قیامەتو پرسیارو وەڵامی ئەو ڕۆژە لە قورئاندا وردببینەوە لەوانەیە هەندێك جێگای بە دژی هەندێکی تر بزانرێت، تاوانباران لەلایەك قسە ناکەن، لەلایەك نەفرین لە

یەکتر دەکەن، لەلایەك وەکو ئێرە وەلامیان نیەو لەلایەکی ترەوە وەکو ئەوەی سورەتی ئەنعام سوێند دەخۆنو دەڵێن موشریك نەبووینو چەندین جێگای تری لەم بابەتە بەلام ئەگەر بزانین کە ئەو ماوە بەهەزاران ساڵە ئینجا مانای ئەم ئایەتانە بە چاکی دەزانیت، چونکە دەگونجێت دەیان ساڵ بێدەنگو دەیان ساڵی تر جنێو بە یەکتردانو چاو لە یەك سوورکردنەوەو دەیان ساڵ بەڵێندان بە ﷲ کە ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ دنیا ئیتر جگە لە ﷲ بەندایەتی بۆ شتێکی تر ناکەن. ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٦٧﴾ ئەوسا ئەو کەسەی کە بگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگارو لە تاوان پەشیمان بووبێتەوەو باوەڕی هێنا بێتو کرداری چاکی کردبێت نزیکە ئەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە ڕیزی ڕزگاربواندا بێت، وشەی (عَسى) بە لای عەبدوڵای کوڕی عەباسەوە لەلای خوا بۆ (وجوب)ە، منیش دەڵێم: قسەی ئاوا لەلای ﷲ ی بێنیهایەت میهرەبانەوەهەر چاوەڕێی ئەوەی لێدەکرێت ئەگەرچی هیچ شتێك لە سەر خوا واجب نیە.

﴿٦٨﴾ خۆ هەر پەروەردگارتە ئەوەی کە ئارەزۆی لێبێت دروستی دەکاتو هەڵیدەبژێرێت، هەڵبژاردن بۆ ئەوان نیە، ﷲ پاكو بێ عەیبەو بەرزەو بێ نیازە لەوەی کە ئەوان دەیکەن بە هاوەڵو هاوبەشی. لێرە بەرونی ئەوەدەگەیەنێت کەمرۆڤ بۆی نیە ڕێگاوڕێباز بەکەیفی خۆی هەڵبژێرێت بەڵکو تەنها خالیق مافی هەڵبژاردنی هەیەومەخلوق ئەومافەی نیە.

﴿٦٩﴾ ئەوسا پەروەردگارت دەزانێت ئەوەی کە لەناو دڵیاندا شاردویانەتەوەو ئەوەش کە ئاشکرای دەکەن، واتە: لەلای ﷲ ئاشکراو شاراوە یەکسانە.

﴿٧٠﴾ خۆ ئەوە ﷲیەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر جگە لەو زاتە نیە، هەر بۆ ئەوەو هەر خۆی شایستەی سوپاسە لە دنیاو لە قیامەتدا، وە بڕیارو یاسا دانان هەر بۆ خۆیەتیو کەسی تر مافی ئەوەی نیە، وە هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە. دەی موسڵمان چاو لەفەرمودەکانی خواکەت بکەولێی بترسە سبەینێ دەچیتەوە بەردەم دادگای ئەوزاتە. ئینجا پەروەردگار باسی دوو نیعمەتی گەورەی خۆی دەکاتو دەفەرموێ:

وَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَيۡءٖ فَمَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتُهَاۚ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿٦٠﴾ أَفَمَن وَعَدۡنَٰهُ وَعۡدًا حَسَنٗا فَهُوَ لَٰقِيهِ كَمَن مَّتَّعۡنَٰهُ مَتَٰعَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا ثُمَّ هُوَ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ مِنَ ٱلۡمُحۡضَرِينَ ﴿٦١﴾ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ أَيۡنَ شُرَكَآءِيَ ٱلَّذِينَ كُنتُمۡ تَزۡعُمُونَ ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَغۡوَيۡنَآ أَغۡوَيۡنَٰهُمۡ كَمَا غَوَيۡنَاۖ تَبَرَّأۡنَآ إِلَيۡكَۖ مَا كَانُوٓاْ إِيَّانَا يَعۡبُدُونَ ﴿٦٣﴾ وَقِيلَ ٱدۡعُواْ شُرَكَآءَكُمۡ فَدَعَوۡهُمۡ فَلَمۡ يَسۡتَجِيبُواْ لَهُمۡ وَرَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَۚ لَوۡ أَنَّهُمۡ كَانُواْ يَهۡتَدُونَ ﴿٦٤﴾ وَيَوۡمَ يُنَادِيهِمۡ فَيَقُولُ مَاذَآ أَجَبۡتُمُ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٦٥﴾ فَعَمِيَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَنۢبَآءُ يَوۡمَئِذٖ فَهُمۡ لَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿٦٦﴾ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلۡمُفۡلِحِينَ ﴿٦٧﴾ وَرَبُّكَ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُ وَيَخۡتَارُۗ مَا كَانَ لَهُمُ ٱلۡخِيَرَةُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٦٨﴾ وَرَبُّكَ يَعۡلَمُ مَا تُكِنُّ صُدُورُهُمۡ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٦٩﴾ وَهُوَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ لَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلۡأُولَىٰ وَٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٧٠﴾

﴿٧١﴾ بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ﷲ هەتا قیامەت بیکات بە شەو جگە لە ﷲ کام خودای تر هەیە کە ڕووناکیتان بۆ بهێنێت؟ ئایا ئێوە هەر نابیستنو فامی هیچتان نیە؟

﴿٧٢﴾ بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ﷲ هەتا قیامەت دنیاتان بۆ بکات بە ڕۆژ جگە لە ﷲ کام پەرستراوێکی تر هەیە کە شەوتان بۆ بهێنێت تا ئارامی تێدا بگرنو بحەسێنەوە؟ ئایا ئێوە هەر چاو ناکەنەوە کەئەم ڕاستیانە ببینن؟

﴿٧٣﴾ جا بەشێك لە سۆزو چاکەی ﷲ، ئەوەیە کە ئەو شەوو ڕۆژەی بۆ داناون بە شێوەیەکی ڕێکوپێك تا لە شەودا ئیسراحەت بکەنو بحەسێنەوەو لە ڕۆژیشدا بۆ بەدەست هێنانی خەیرو بەیرە فرەوانەکانی ئەو کارو کۆشش بکەن، بەو ئومێدەی کە ئێوەیش سوپاسی بکەنو نمەك نەناس نەبن، جا ئەوانەی کە جگە لە ﷲ دەیانپەرستن هەر وەك لە دنیادا هیچ دەسەڵاتێکیان لە سەر هاتنی شەوو ڕۆژ نیە کە هۆی ئەو هەمو خەیرو بەیرەن بۆتان، هەر ئاوا لە قیامەتیشدا هیچ چاکەیەکیان لە دەست نایەت بۆتان دەی بیری ئەو ڕۆژە بکەنەوە.

قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَآءٍ ۖ أَفَلَا تَسْمَعُونَ ﴿٧١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن جَعَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكُمُ ٱلنَّهَارَ سَرْمَدًا إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَنْ إِلَٰهٌ غَيْرُ ٱللَّهِ يَأْتِيكُم بِلَيْلٍ تَسْكُنُونَ فِيهِ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٧٢﴾ وَمِن رَّحْمَتِهِۦ جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ لِتَسْكُنُوا۟ فِيهِ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ فَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تَزْعُمُونَ ﴿٧٤﴾ وَنَزَعْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا فَقُلْنَا هَاتُوا۟ بُرْهَٰنَكُمْ فَعَلِمُوٓا۟ أَنَّ ٱلْحَقَّ لِلَّهِ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٧٥﴾ ۞ إِنَّ قَٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾

﴿٧٤﴾ جا باس بکە بۆیان ئەو ڕۆژەی کەﷲ بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: کوان ئەوانەی کە ئێوە گومانتان دەبرد کە ئەوانە هاوبەشی منن‌و دەتوانن یارمەتیتان بدەن‌و تکاتان بۆ بکەن؟ هاوبەشی دانان بۆ ﷲ تاوانێکی زۆر گەورەیەو ﷲ بە بێ پەشیمان بونەوەو تەوبە لێکردنی پێش مردن چاوپۆشی لێ ناکاتو موشریکان بۆ هەمیشە جێگایان ئاگری داخی دۆزەخە .

﴿٧٥﴾ لە هەمو گەل‌و تاقمێك شایەتێك کە پێغەمبەری ئەو گەلەو پیاو چاك‌و ڕاستگۆیانی هەر تاقم‌و تیرەو عەشیرەتێکەن دەردەهێنین، ئینجا لە بێباوەڕانی ئەو تاقم‌و گەل‌و عەشیرەت‌و تیرە پرسیار دەکرێت لەو کارو کۆششەی کە لە دنیادا کردویانە، جا پێمان وتن ئادەی بەڵگەکانتان بهێنن ئینجا دەزانن کە حەق‌و ڕاستی هەر لەلای ﷲیەو ئەو درۆو قسەپوچو بێ کەڵکانەی کە هەڵیان بەستوە لە دنیادا لە بیریان نامێنێت، بەڵکودە بێ بە هۆی شەرمەزاری‌و سەرشۆڕی قیامەتیان.

﴿٧٦﴾ بێگومان کە قارون لە گەلی موساو لە خزمانی بو، مام یان ئامۆزای بو کەچی بە ناحەق دەستدرێژی کردە سەریان، کە ئەوندە گەنجێنەمان بەو دابو کە هەڵگرتنی کلیلەکانی بە تەنهایی تاقمێکی خاوەن هێزی ماندوو شەکەت دەکرد، جا بەم هۆیەوە لەحیاتی سوپاسی ﷲ ناسوپاسی کردو زۆر لوت بەرزو خۆ بەزلزان بو، جا باس بکەبۆیان ئەوکاتەی کە خەڵکی تیرەکەی پێیان وت: لوت بەرزو خۆ بەزلزان مەبە، بەڕاستی ﷲ خۆ بەزلزانانی خۆش ناوێت.

﴿٧٧﴾ جا بەو سامانە زۆرەی کە ﷲ پێی بەخشیوی ماڵی دواڕۆژتی پێ بەدەست بهێنەو بەشی ژیانی دنیای خۆتیشت لە بیر نەچێت، جا چاکە بکە هەروەك ﷲ چاکەی لەگەڵتا کردووەو ئەو هەمو سەروەت‌و سامانەی پێداویت، وە لەسەر زەویدا خراپە نەکەیت چونکە بێگومان کە ﷲ خراپەکارانی خۆش ناوێ.

﴿٧٨﴾ قارون وتی: ئەوەی کە بە من دراوە بەهۆی زانیاری خۆمەوەیە هیچ منەتی تێدا نیەو خۆم شایستەی ئەم ماڵ‌و سامانەم کە پێم دراوە، پەروەردگاریش بە دەمیدا دەداتەوەو دەفەرموێ: ئایا نازانێت کە بەڕاستی ﷲ پێش ئەو گەلانێکی زۆری لەناوبردوە کە لەو بە تواناترو سەروەتمەندتر بوون؟ جا پرسیار لە تاوانی تاوانباران ناکرێت بۆچاوپۆشی لێکردنیان چونکە ﷲ دەیناسێت‌ودەزانێ چییان کردوە، ئەوانە تەنها پرسیاریان بۆ سەرزەنشت‌و لۆمە لێدەکرێت، جا بەم شێوە مانایە ئەم ئایەتە لەگەڵ ئەو ئایەتانەی پرسیاری کافران وەکو ئایەتی ﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ ﴾ حیجر: ٩٢/واتە: سوێند بە پەروەردگار پرسیار لە هەموتان دەکرێت﴾ یەك دەگرێتەوە. بەڵێ قارون گوێی بە ئامۆژگاریی پیاو باشانی گەلەکەی نەداو هەر بە باشی‌و بۆشی خۆیەوە خەریك بو.

﴿٧٩﴾ جا لەو کاتەدا بەو بەرگە ڕازاوەو دەست‌و پێوەندە زۆرەیەوە هاتە ناو تیرەکەی، خۆ ئەوانەی کە ژیانی دنیایان دەویست وتیان: ئای خۆزگە وەك ئەوەی کە بە قارون دراوە بەئێمەش بدرایە بێگومان ئەوە بەشێکی زۆر گەورەیە کە بەو دراوە لە ماڵی دنیا، دیارە ئەمە هەڵوێستی دنیا ویستانە بەڵام ئەوانەی کە بە چاکی دنیا دەناسن‌و بەو سەروەت‌و سامانە فریو ناخۆن هەڵوێستیشان جیاوازە وەك دەفەرموێ:

﴿٨٠﴾ جا ئەوانەی کە زانیاری ڕاستەقینەیان پێدرا بو کە یەکخواپەرستی‌و خۆ ئامادەکرنە بۆ ماڵی خۆشترو هەتاهەتای بەو

تاقمە دنیا ویستەیان وت: هەی سەر لێشێواوو ماڵ وێرانان دەك لە ناوچن ئەوە چی دەڵێن؟ ئەو پاداشتەی کە اللە داینراوە بۆ ئەو کەسەی کە باوەڕی هێنا بێتو کرداری چاکی کرد بێت کە بریتیە لە بەهەشتو نازو نیعمەتەکانی زۆر چاکترە لەوەی کە دراوە بە قارون لە دنیادا، ئەوسا جگە لە خۆگران بە کەسیتر ئەم نازو نیعمەتی گەورەو هەتاهەتاییە نادرێت.

لە فەرمودە دا هاتوە کە اللە بە بەندەکانی دەفەرموێ: {أعدَدتُ لِعبَادِيَ الصَّالحِين مَالا عَينٌ رَأت وَلاَ أُذُنٌ سَمِعَت، وِلاَ خَطَرَ عَلَي قَلب بَشَر/احمد.صحيه الالباني/ ئەوەی کە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستوەو نەهاتوە بە دڵی هیچ کەسێکدا ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم}

جا کاتێك پەروەردگار باسی لوت بەرزی قارونو شانازی کردنی بەسەر گەلەکەیداو خۆ ڕازاندنەوەی کرد باسی سەرئەنجامی ئەو هەڵس وکەوتەیشی دەکاتو دەفەرموێ:

(٨١) جا ئەومان بە ماڵەکەیشیەوە برد بە ناخی زەویدا ئەوسا هیچ دەستەیەکیش نەبو لە سزای اللە بیپارێزێت، وە خۆیشی لەوانە نەبو کە سەرکەوتن بەدەست بهێنێتو تۆڵەی خۆی بکاتەوە.

(٨٢) ئەوسا ئەو کەسانەی کە دوێنێ ئاواتی جێگای ئەویان دەخواست، وا ئێستا پاش بە ناخی زەویدا چوونی قارونو ماڵەکەیشی لەو ئاواتەی خۆیان پەشیمانو دەڵێن: وای خۆوا دەردەکەوێت کە بەڕاستی اللە بۆ هەر کەسێك لە بەندەکانی کە ئارەزۆی لێبێت ڕۆزی فرەوان دەکاتو بۆ هەر کەسێکیش کە ئارەزۆی لێ بێت دەیگرێتەوەو کەم دەستی دەکات، جا دەڵێن: ئەگەر اللە منەتی نەخستایە سەرمان ئێمەیشی بە ناخی زەویدا دەبردە خوارەوە، وای بەڕاستی بێباوەڕان ڕزگار نابن.

وشەی ﴿وَيۡكَأَنَّ﴾ هەندێك بەلایانەوە ( وَيلَكَ اِعلَم أنَ...واتە: وای بۆ تۆ بزانە بەڕاستی... کە وشەی (اِعلَم) وپیتی(لـ) لە [وَيلَكَ] لابراون. والله أعلم.

(٨٣) ئەوە ماڵی دوا ڕۆژەو ئێمە هەر بەو کەسانە دەدەین کە لەم زەویەدا نایانەوێت لوت بەرزو خراپە کێڵ بن، وە پاشە ڕۆژیش

قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلۡمٍ عِندِيٓۚ أَوَلَمۡ يَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ قَدۡ أَهۡلَكَ مِن قَبۡلِهِۦ مِنَ ٱلۡقُرُونِ مَنۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُ قُوَّةٗ وَأَكۡثَرُ جَمۡعٗاۚ وَلَا يُسۡـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٧٨﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ فِي زِينَتِهِۦۖ قَالَ ٱلَّذِينَ يُرِيدُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا يَٰلَيۡتَ لَنَا مِثۡلَ مَآ أُوتِيَ قَٰرُونُ إِنَّهُۥ لَذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٧٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ وَيۡلَكُمۡ ثَوَابُ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّمَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗاۚ وَلَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلصَّٰبِرُونَ ﴿٨٠﴾ فَخَسَفۡنَا بِهِۦ وَبِدَارِهِ ٱلۡأَرۡضَ فَمَا كَانَ لَهُۥ مِن فِئَةٖ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُنتَصِرِينَ ﴿٨١﴾ وَأَصۡبَحَ ٱلَّذِينَ تَمَنَّوۡاْ مَكَانَهُۥ بِٱلۡأَمۡسِ يَقُولُونَ وَيۡكَأَنَّ ٱللَّهَ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُۖ لَوۡلَآ أَن مَّنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا لَخَسَفَ بِنَاۖ وَيۡكَأَنَّهُۥ لَا يُفۡلِحُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٢﴾ تِلۡكَ ٱلدَّارُ ٱلۡأٓخِرَةُ نَجۡعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوّٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فَسَادٗاۚ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾ مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ خَيۡرٞ مِّنۡهَاۖ وَمَن جَآءَ بِٱلسَّيِّئَةِ فَلَا يُجۡزَى ٱلَّذِينَ عَمِلُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٨٤﴾

هەر بۆ پەرهیزکارانە، خۆ بەزلزانیو لوت بەرزی سیفەتێکی ناپەسندو بێزراوە لەلای اللە.

هەر بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { إنَّ اللَّهَ أَوْحَى إِلَيَّ أَنْ تَوَاضَعُوا حَتَّى لا يَفْخَرَ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ وَلَا يَبْغِ أَحَدٌ عَلَى أَحَدٍ/ متفق عليه/ بێگومان اللە نیگای کراوەتەلام کە ئەوەندە خۆتان نزم بکەنەوە تا هیچ کەسێك بەسەر کەسێکی تردا خۆی هەڵنەکێشێت، وە هیچ کەسێکیش دەست درێژی نەکاتە سەر کەسێکی تر}

(٨٤) هەر کەسێك چاکەیەك بکات زیاتر لەو چاکەیەی بۆ هەیە، کە لای خواوی دە بەرامبەرە، وە هەر کەسێکیش کاری خراپ ئەنجام بدات ئەوسا ئەوانەی کە ئەو کردارگەلە خراپەیان کردوە جگە لەو کارانەی کە کردویانە تۆڵەیان لێ وەرناگیرێت.

(٨٥) بێگومان ئەو زاتەی کە قورئانی بۆ تۆ ناردوە دەتگەڕێنێتەوە بۆ قیامەتو حیسابهو پرسیاری کارو کۆششی خۆتو هەڵوێستی گەلەکەت لێدەکرێت، بەو کەسانەی کە باوەڕت پێ ناکەن بڵێ: پەروەردگارم زاناترە بەو کەسەی کە لەسەر ڕێنمایی و هیدایەتەو ئەوکەسەش کە لەناو گومڕاهی ئاشکرادایە.

إِنَّ ٱلَّذِى فَرَضَ عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ لَرَآدُّكَ إِلَىٰ مَعَادٖۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ مَن جَآءَ بِٱلۡهُدَىٰ وَمَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٨٥﴾ وَمَا كُنتَ تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۖ فَلَا تَكُونَنَّ ظَهِيرٗا لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴿٨٦﴾ وَلَا يَصُدُّنَّكَ عَنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بَعۡدَ إِذۡ أُنزِلَتۡ إِلَيۡكَۖ وَٱدۡعُ إِلَىٰ رَبِّكَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَا تَدۡعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۘ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ كُلُّ شَيۡءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجۡهَهُۥۚ لَهُ ٱلۡحُكۡمُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٨﴾

٢٩ سُورَةُ العَنكَبُوتِ ٦٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ﴿٢﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣﴾ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿٤﴾ مَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ ٱللَّهِ فَإِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ لَأٓتٖۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٥﴾ وَمَن جَٰهَدَ فَإِنَّمَا يُجَٰهِدُ لِنَفۡسِهِۦٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

﴿٨٦﴾ خۆ تۆ بەو هیوایە نەبویت کە ئەم قورئانەت بۆ بێت بەڵام ئەو قورئانەت بۆ هات کە بەزەیی‌و سۆزێك بو لەلایەن پەروەردگارتەوە، جا تۆش هەرگیز پشتیوانی لە خوانەناسان نەکەیت، بەڵکو لێیان جیا ببەرەوەو لە خۆت دوریان بخەرەوەو بە پێچەوانەیانەوە بجوڵێرەوە.

﴿٨٧﴾ ئەوسا پاش ئەوەی کە نیشانەکانی الله هاتە لات نابێت ئەوان تۆ لەوە لابدەن‌و لە بڵاوکردنەوەی نیشانەکانی الله رێگات لێ بگرن، جا تۆ خەڵکی بەرەو ئاینی پەروەردگارت بانگ بکەو تۆ لە موشریکان نەبیت، ئەمە ڕوی لە پێغەمبەرە ﷺ و مەبەست ئوممەتەکەیەتی، هەروەها ئەم ئایەتەیش کە دەفەرموێ:

﴿٨٨﴾ لەگەل اللهدا هیچ پەرستراوێکی تر مەپەرستە، چونکە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر جگە لەو نیە، هەمو شتێك لەناو دەچێت بێجگە لە زاتی خۆی، هەر بۆ ئەوە بڕیارو فەرمان‌و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە بۆ حیساب‌و کیتاب‌و هەر ئەویشە پاداشتان دەداتەوە چاکە بە چاك‌و خراپەیش بە خراپ.

## ٢٩ سورەتی عەنکەبوت ٦٩

سورەتی عەنکەبوت کە سورەتی بیست‌و نۆهەمی قورئانە، شەست‌و نۆ ئایەتە، لە دواترین سورەتانێکە کە لە مەکەدا هاتوتە خوارەوەو هەندێکش وتویانە کە لە مەدینەدا دابەزیوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی هەشتاو پێنجەمەو پاش سورەتی (الروم)و پێش (المطففين) دابەزیوە. وشەی (الْعَنْكَبُوت: جاڵجاڵۆکە) لە قورئاندا تەنها دووجار ئەویش لە ئایەتی چل‌ویەکەمی ئەم سورەتەدا هاتوە.

بەناوی الله ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ ئەلیف، لام، میم. هەرخوا دەزانێ مەبەست چییە.

﴿٢﴾ ئایا خەڵکی وا دەزانن کە وازیان لێ دەهێنرێت کە وتیان باوەڕمان هێناوەو ئەوان تاقی ناکرێنەوە؟

﴿٣﴾ لە کاتێکدا ئەوانەی پێش ئەوانمان تاقی کردوەتەوە تا الله ئەوانەی کە ڕاستیان کردوە لە بیرو باوەڕیاندا، ئەوانەش کە درۆزنن دەریان بخات‌و لەیەکیان جیا بکاتەوە.

﴿٤﴾ ئایا ئەوانەی کە خراپە کێڵن وا دەزانن لە دەست ئێمە دەردەچن؟ ئای چەند خراپ بڕیار دەدەن، چۆن دەگونجێت کە ئەوان لە دەستی پەروەردگاری بە توانا دەربچن؟

﴿٥﴾ هەر کەسێك بە هیوای گەیشتن بە الله بێت لە پاشەڕۆژداو لە دنیادا ئیشی چاکی کردبێت، ئەوسا بە بێگومان ئەو ماوەیەی کە الله دایناوە دێت‌و بە پەروەردگار شادمان دەبێت، خۆ ئەو زاتە بیسەری هەمو قسەو زانەری هەمو شتێکە ئاشکرا بێت یان پەنهان.

﴿٦﴾ جا هەر کەسێك خۆی زەحمەت بدات بۆ ئەنجامدانی ئیشی چاك ئەوە ئەو ئیشە چاکەی هەر بە سوودی خۆیەتی، بێگومان کەالله بێنیازە لە هەمو جیهانیان.

﴿٧﴾ ئەوسا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئیشی باشیان کردوە بە دڵنیاییەوە ئێمە تاوانەکانیان دادەپۆشین‌و نایخەینە ڕوو، وە بە چاکتر لەوەیش کە کردویانە پاداشتیان دەدەینەوە.

﴿٨﴾ فەرمانماندا بەسەر مرۆڤدا کە چاکە بکا لەگەڵ باوك‌و دایکیدا، جا ئەگەر ئەوان هەڵیان پێچایت لەسەر ئەوەی کە تۆ هاوبەشم بۆ دابنێیت بە شتێك کە تۆ هیچ زانیاریەکت بەو شتە نیە ئەوسا لەمبارەوە بە گوێیان مەکە، گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە، جا تێتان دەگەیەنم کە چیتان کردوە.

ئەم ئایەتە لە بارەی سەعدی کوڕی ئەبو وەقاسەوە هاتوە کە وتویەتی چوار ئایەت لە بارەی منەوە دابەزیون جا باس دەکات‌و دەڵێ :دایکی پێی وت: ئایا الله فەرمانی نەکردوە کە بە گوێی باوك‌و دایکت بکەیت؟ بە الله قەسەم هیچ خواردن‌و خواردنەوەیەك ناخۆم هەتا دەمرم یان تۆ کافر نەبیتەوە، سەعد دەڵێ: جا هەر کاتێك بیان ویستایە کە خواردنی پێبدەن بە دار

دەمیان دەکردەوە جا ئەم ئایەتە دابەزیوسەعد بەدایکی وت: دایە چەندین گیانت هەبێو هەموویان دەرچن من وازلەئایین ناهێنم خواردن دەخۆی یان ناخۆی ئارەزۆی خۆتە جا دایکی دڵنیابو کە پەشیمان نابێتەوە دەستی کردەوە بەخواردن، سەعدیش بووبەو خەباتگێرە موجاهیدو قارەمانەی کە ئیمبەراتۆری فارسی بە چۆکدا هێنا(خوا لێی رازی بێ).

(٩) جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە و کرداری چاکیان کردوە بەڕاستی ئەوانە دەخەینە ناو پیاو چاکانەوە کە پێغەمبەرانو دۆستانی خوداو شەهیدانو ڕاستگۆیانو لەگەڵ ئەواندا کۆ دەکرێنەوە.

(١٠) خۆ هەندێك لە خەڵکیش هەن کە دەڵێن باوەڕمان هێناوە بە ﷲ، جا ئەوانە هەر کاتێك لەبەر ﷲو لەسەر ڕێبازی ئەو ئازار بدرێن ئەو ئێشو ئازارەی خەڵك لایان وەکو سزای ﷲ وایەو دەترسنو پەیڕەویان دەکەنو واز لە ڕێبازی ﷲ دەهێنن، لە کاتێکدا ئەگەر لەلایەن پەروەردگارتەوە سەرکەوتنێك بە دەست بهێنی، بەڕاستی دەڵێن ئێمەش لەگەڵ ئێوەدا بووینو داوای دەستکەوتت لێ دەکەن، مەگەر ﷲ ئاگادارتر نیە بەوەی کە لە ناو دڵی خەڵکدایە؛

(١١) تاکو ﷲ دەربخات ئەو کەسانەی کە بەڕاستی باوەڕیان هێناوەو ئەو کەسانەش کە مونافقو دووروون.

(١٢) جا کافرەکان دەڵێن بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە وەرن دوای ڕێبازی ئێمە بکەونو بە گوێی ئێمە بکەن، هەقتان نەبێت ئێمە لە ڕۆژی قیامەتدا تاوانەکانی ئێوە هەڵدەگرینو گوناهتان لەسەر ئێمە. لە کاتێکدا ئەوان هیچ شتێك لە تاوانەکانی ئەوان هەڵناگرن، بێگومان کە ئەوان درۆزنن.

(١٣) جا ئەوانەی کە خەڵك بۆ کوفرو بێدینی بانگ دەکەن باری گرانی خۆیان هەڵدەگرن، وە لەگەڵ باری گرانی خۆیاندا باری گرانی خەڵکی تریش کەبەقسەی ئەوان فریویان خواردوە هەڵدەگرنو بەدڵنیاییەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە بارەی ئەو درۆ و دەلەسانەی کە دەیان کرد، پرسیاریان لێدەکرێت.

پێغەمبەرانﷺ دەفەرموێ: { وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ كَانَ عَلَيْهِ مِنْ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا /مسلم/ هەر کەس خەڵکی بانگ بکات بۆ گومڕایی بە ئەندازەی تاوانی ئەو کەسانەی کە پەیڕەوی دەکەن تا ڕۆژی قیامەت تاوانی لەسەرە بە

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَحۡسَنَ ٱلَّذِي كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾ وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ حُسۡنٗاۖ وَإِن جَٰهَدَاكَ لِتُشۡرِكَ بِي مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٞ فَلَا تُطِعۡهُمَآۚ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُدۡخِلَنَّهُمۡ فِي ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٩﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ فَإِذَآ أُوذِيَ فِي ٱللَّهِ جَعَلَ فِتۡنَةَ ٱلنَّاسِ كَعَذَابِ ٱللَّهِ وَلَئِن جَآءَ نَصۡرٞ مِّن رَّبِّكَ لَيَقُولُنَّ إِنَّا كُنَّا مَعَكُمۡۚ أَوَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَعۡلَمَ بِمَا فِي صُدُورِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٠﴾ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴿١١﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبِعُواْ سَبِيلَنَا وَلۡنَحۡمِلۡ خَطَٰيَٰكُمۡ وَمَا هُم بِحَٰمِلِينَ مِنۡ خَطَٰيَٰهُم مِّن شَيۡءٍۖ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٢﴾ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴿١٣﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامٗا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾

بێ ئەوەی کە هیچ شتێك لە تاوانی ئەو شوێنکەوتوانەش کەم ببێتەوە}

وە هەروەها وتراوە: کە لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوی وا دەهێنن کە چاکەی زۆرە جا ئەوەندە تۆڵەی لێوەردەگیرێتەوە بۆ خەڵك هەتا چاکەکانی تەواو دەبێت پاشان هەم داوای لێدەکرێت، جا ﷲ دەفەرموێ: تۆڵە وەرگرن لە بەندەم ئەوسا فریشتەکان دەڵێن: هیچ چاکەی نەماوە دەفەرموێ: لە خراپەی ستەم لێکراو هەڵگرنو بیخەنە سەر شانی ئەوو باری گوناهی ئەوانیش هەڵدەگرێت. ئینجا پەروەردگار بۆ دڵدانەوەی پێغەمبەرمان ﷺ بە کورتی باسی چەند پێغەمبەرێك دەکات لەوانە نوح پێغەمبەرە عليه السلامو دەفەرموێ:

(١٤) بەڕاستی ئێمە نوح پێغەمبەرمان عليه السلام نارد بۆ لای گەلەکەی بۆ ئەوەی دەست لە بت پەرستی هەڵگرنو ڕوبکەنە پەروەردگاری تاكو تەنیا، جا ئەویش لە ناو ئەو گەلەی خۆیدا نۆ سەدو پەنجا ساڵ مایەوەو بەبەردەوامی بەرەو یەکخواپەرستی بانگی کردن، بەڵام ئەوان جگە لە ژمارەیەکی زۆر کەم باوەڕیان پێ نەهێناو گاڵتەیان پێدەکرد، جا لێزمە بارانی ئاسمانو ئاوی ناو زەوی

فَأَنجَيۡنَٰهُ وَأَصۡحَٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلۡنَٰهَآ ءَايَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ وَإِبۡرَٰهِيمَ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُۖ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّمَا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوۡثَٰنٗا وَتَخۡلُقُونَ إِفۡكًاۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَمۡلِكُونَ لَكُمۡ رِزۡقٗا فَٱبۡتَغُواْ عِندَ ٱللَّهِ ٱلرِّزۡقَ وَٱعۡبُدُوهُ وَٱشۡكُرُواْ لَهُۥٓۖ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تُكَذِّبُواْ فَقَدۡ كَذَّبَ أُمَمٞ مِّن قَبۡلِكُمۡۖ وَمَا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٨﴾ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ كَيۡفَ يُبۡدِئُ ٱللَّهُ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥٓۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١٩﴾ قُلۡ سِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ بَدَأَ ٱلۡخَلۡقَۚ ثُمَّ ٱللَّهُ يُنشِئُ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأٓخِرَةَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٢٠﴾ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَرۡحَمُ مَن يَشَآءُۖ وَإِلَيۡهِ تُقۡلَبُونَ ﴿٢١﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٢٢﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَلِقَآئِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ يَئِسُواْ مِن رَّحۡمَتِي وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢٣﴾

گرتنیو هیچیان دەرباز نەبون، لە کاتێکدا کە ئەوان ستەمکار بون.

﴿١٥﴾ ئەوسا ئێمە خۆیو ئەوانەی کە لە ناو کەشتیەکەیدا بوون ڕزگارمان کردن، جا ئەم ڕووداوەمان کردوە بە نیشانەیەك بۆ پەندو ئامۆژگاری جیهانیان.

﴿١٦﴾ جا باسی ئیبراهیمیش ﷺ بکە ئەو کاتەی کە بەگەلەکەی وت: بەندایەتی ﷲ بکەنو خۆتان بپارێزن لەو شتانەی کە دەبنە هۆی سزای ﷲ بۆتان، هەرئەوە چاکە بۆتان ئەگەر بزانن.

﴿١٧﴾ ئەوانەی کە جگە لە ﷲ دەیانپەرستن بت گەلێکن، وە درۆو بوختانێکە کەدروستان کردوە بێگومان ئەوانەی کە ئێوە جگە لە ﷲ بەندایەتی بۆ دەکەن خاوەنی هیچ ڕۆزیەکیش نین بۆتان، جا کە وابو هەر لە ﷲ داوای ڕۆزی بکەنو هەر بەندایەتی بۆ ئەو بکەنو هەر ئەو بپەرستنو سوپاسی ئەو بکەن کەهەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنرێنەوە.

﴿١٨﴾ جا ئەگەر ئێوە بە درۆم دەخەنەوەو باوەڕم پێ ناکەن بەڕاستی گەلانێکی زۆریش پێش ئێوە باوەڕیان نەکرد بە پێغەمبەرانی خۆیان، وە لەسەر ئەم ڕەوانەکراوە جگە لە گەیاندنی پەیامەکەی بە رونیو ئاشکرایی شتێکی تر نیە. جا باوەڕ دەهێنن قازانج دەکەنو نایهێنن هەر خۆتان زیان دەکەن.

﴿١٩﴾ ئایا نازانن کە ﷲ چۆن سەرەتا دروستکردنی دەست پێ کرد؟ دەی باش بزانن کە پاشان زیندویشی دەکاتەوە، بێگومان ئەوە لەلای ﷲ زۆر ئاسانە.

﴿٢٠﴾ بڵێ: بەناو ئەم زەویەدا بگەڕێن جا تەماشا بکەنو وردببنەوە بزانن چۆن لەسەرەتادا دروستکردنی دەست پێکرد؟ پاشان ﷲ جارێکی تر زیندوتان دەکاتەوە بۆ لێپرسینەوە، بێگومان ﷲ بە توانایە بەسەر هەمو شتێکدا.

﴿٢١﴾ جا ئەو کاتە کە زیندوی کردنەوە ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت سزای دەدات لەسەر ئەو خراپانەی کە کردویەتیو ئەو کەسەیش کە ئارەزۆی لێ بێت بەزەیی پێدا دێتەوەو سزای نادات، خۆ هەر بۆ لای ئەو دەتان هێننەوە.

﴿٢٢﴾ جا ئێوە نە لە زەویو نە لە ئاسماندا ناتوانن خۆتان ڕزگار بکەنو لە دەستی ﷲ دەربچن، ئەوسا بۆ ئێوە جگە لە ﷲ هیچ دۆستو یارمەتیدەرێك نیە.

﴿٢٣﴾ خۆ ئەو کەسانەی کە بە ئایەتەکانی ﷲو بە گەیشتن بەو زاتە بێباوەڕن، ئەوانە نائومێد بوون لە بەزەیی من، ئەوسا بۆ ئەوانە سزای بە ژان هەیە. ئینجا دەگەڕێتەوە سەر چیرۆکی ئیبراهیم پێغەمبەر ﷺ ودەفەرموێ:

﴿٢٤﴾ جا ئەو گەلەی جگە لەوەی کە وتیان: بیکوژن یان بیسوتێنن هیچ وەڵامێکی تریان بۆی نەبو، جا ئاگریان بۆ کۆکردەوەو خستیانە ناویەوە بەڵام ﷲ لەو ئاگرە ڕزگاری کرد، بێگومان لەو باسو داستانەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە باوەڕ دەهێنن.

﴿٢٥﴾ جا وتی: ئەوەی کە جگە لە ﷲ کردوتانن بە خودای خۆتان بت گەلێکن کەهۆی خۆشەویستیو دۆستایەتی نێوانتانە لە دنیادا، پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا باوەڕ بە یەکتر

فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱقْتُلُوهُ أَوْ حَرِّقُوهُ فَأَنجَىٰهُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلنَّارِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٢٤﴾ وَقَالَ إِنَّمَا ٱتَّخَذْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ أَوْثَٰنًا مَّوَدَّةَ بَيْنِكُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُ بَعْضُكُم بِبَعْضٍ وَيَلْعَنُ بَعْضُكُم بَعْضًا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٥﴾ ۞ فَـَٔامَنَ لَهُۥ لُوطٌ ۘ وَقَالَ إِنِّى مُهَاجِرٌ إِلَىٰ رَبِّىٓ ۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٦﴾ وَوَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَجَعَلْنَا فِى ذُرِّيَّتِهِ ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلْكِتَٰبَ وَءَاتَيْنَٰهُ أَجْرَهُۥ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٢٧﴾ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُواْ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾

ناکەن، بەڵکو نەفرینو لەعنەت لە یەکتر دەکەن، بەڵام تازە ئەو بێزاریو نەفرین لەیەکتر کردنە هیچ سوودێکتان پێنادات، ئەوسا جێگاتان ئاگرەو هیچ یارمەتیدەرێکیشتان نیە.

(٢٦) ئەوسا لووت ی برازای ﷺ باوەڕی پێ هێناو ئیبراهیم وتی: بەڕاستی من بۆ لای پەروەردگاری خۆم کۆچ دەکەم واتە: لەوڵاتی خۆم کە خەڵکەکەی دژایەتیم دەکەنو باوەڕم پێ ناهێنن کۆچ دەکەم بۆ جێگایەکی تر لەبەر گەیاندنی پەیامەکەمو پارێزگاری لە بیرو باوەڕم بەڕاستی هەر خۆیەتی بەهێزو کار بەجێو دانا.

دەڵێن ئیبراهیم ﷺ یەکەم کەس بووە کە لەبەر ﷲ لە وڵاتو کەسو کاری خۆی دەستی شۆرد بێتو بەرەو هەندەران چوو بێت کە لوت ی برازایو سارە خاتونی خێزانی لەگەڵدا بووە لە عێراقەوە بۆ شامو بۆ فەلەستین، ئەگەر چی هەندێ لە تەفسیر زانان ئەم قسەیان بە قسەی لووت زانیوە، جا بەهۆی ڕاستیو لێ برانی بۆ ﷲ، پەروەردگار خەڵاتی کردو منداڵی پێدا وەکو دەفەرموێ:

(٢٧) ئەوسا ئێمەش ئیسحاقو لەویش یەعقوبمان پێبەخشیو زیاد لەویش لەناو نەوەی ئەودا پێغەمبەرایەتیو ڕەوانە کردنی پەڕاومان دانا، وە لە دنیادا پاداشتی چاکەی خۆیمان پێداو بێگومان لە ڕۆژی دوایشدا لەناو پیاوچاکاندایە. لە موساوە ﷺ هەتا پێغەمبەرمان ﷺ هەمووی نەوەی ئەو پێغەمبەرە گەورو بەڕێزەیە ﷺ، بەڕاستی هەروەك چۆن تاکە کەسبو کە بۆ ﷲ هەموو شت فیدا کات، هەروا تاکە کەسێکیشە کە لەلایەن هەموو خاوەن ئایینەکانەوە ڕێزی هەبێ. ئینجا پەروەردگار باسی لووت پێغەمبەر ﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

(٢٨) باسی لووت بکە بۆ گەلەکەت ئەو کاتەی کە بە گەلەکەی وت: بەڕاستی ئێوە کارێکی قێزەونی وا دەکەن کە لەم جیهانەدا هیچ کەس لێتان پێش نەکەوتوە.

(٢٩) بێگومان ئێوە نێربازی دەکەنو ڕێگری دەکەنو لەناو کۆڕەکانتاندا ئیشی خراپ بە بەرچاوی یەکترەوە دەکەن، جا وەڵامی گەلەکەی جگە لەوەی کە بە گاڵتەوە پێیان وت: تۆ سزای ﷲ مان بۆ بهێنە ئەگەر ڕاست دەکەیت، شتێکی تر نەبو.

(٣٠) ئەویش ڕووی لە پەروەردگاری کردو وتی: ئەی پەروەردگارم یارمەتیم بدەو سەرم بخە بەسەر ئەم گەلە خراپە کارەدا، دیارە پەروەردگار نزاکەی لێ وەرگرت، جا ڕاسپاردەکانی ﷲ دابەزینو پێشەکی ڕوویان کردە لای ئیبراهیم.

(٣١) جا لەو کاتەی کە نێرراوانی ئێمە هاتنە لای ئیبراهیم و موژدەی کوڕیان پێدا، وتیان: ئێمە خەڵکی ئەو گوندە لەناو دەبەین چونکە خەڵکەکەی ستەمکارن.

وَلَمَّا جَآءَتۡ رُسُلُنَآ إِبۡرَٰهِيمَ بِٱلۡبُشۡرَىٰ قَالُوٓاْ إِنَّا مُهۡلِكُوٓاْ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِۖ إِنَّ أَهۡلَهَا كَانُواْ ظَٰلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَ إِنَّ فِيهَا لُوطٗاۚ قَالُواْ نَحۡنُ أَعۡلَمُ بِمَن فِيهَاۖ لَنُنَجِّيَنَّهُۥ وَأَهۡلَهُۥٓ إِلَّا ٱمۡرَأَتَهُۥ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَلَمَّآ أَن جَآءَتۡ رُسُلُنَا لُوطٗا سِيٓءَ بِهِمۡ وَضَاقَ بِهِمۡ ذَرۡعٗا وَقَالُواْ لَا تَخَفۡ وَلَا تَحۡزَنۡۖ إِنَّا مُنَجُّوكَ وَأَهۡلَكَ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَ كَانَتۡ مِنَ ٱلۡغَٰبِرِينَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا مُنزِلُونَ عَلَىٰٓ أَهۡلِ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ رِجۡزٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ بِمَا كَانُواْ يَفۡسُقُونَ ﴿٣٤﴾ وَلَقَد تَّرَكۡنَا مِنۡهَآ ءَايَةَۢ بَيِّنَةٗ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٣٦﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ﴿٣٧﴾ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ﴿٣٨﴾

﴿٣٢﴾ ئیبراهیم عليه السلام پاش ئەوەی کە زانی داوای مۆڵەت بۆ کردنیان بێسوودە وتی: بێگومان ئەو گوندە لووتیشی تێدایە؟! وتیان: ئێمە چاکتر دەزانین بەو کەسەی کە لەوێدایە بەڕاستی ئەوو دەستو پێوەندیشی ڕزگار دەکەین جگە لە خێزانی کە ئەو لەناو ئەواندا دەمێنێتەوە.

﴿٣٣﴾ جا لەو کاتەدا کە نێرراوەکانی ئێمە هاتنە لای لووت عليه السلام هەر بە بینیان نیگەران و دڵ تەنگ بو وتیان: مەترسەو خەم مەخۆ بەڕاستی ئێمە خۆت و دەستو پێوەندیشت ڕزگار دەکەین جگە لە خێزانت کە لەناو ئەواندا بۆ تامکردنی ئەو سزایە دەمێنێتەوە.

﴿٣٤﴾ بەڕاستی ئێمە بۆ خەڵکی ئەم جێگەیە لە ئاسمانەوە سزایان بۆ دادەبەزێنین چونکە ئەوان لەخراپە کاری و بێ ڕەوشتیدا لە سنور تێپەڕیون.

﴿٣٥﴾ خۆ بەڕاستی ئێمە لەو جێگادا بەڵگەیەکی گەورەو ڕۆشنمان بەجێ هێشت بۆ ئەو گەلەی کە تێدەگەن و لە شت ورد دەبنەوە. ئینجا دەچێتە سەر باسی شوعەیب پێغەمبەر عليه السلام دەفەرموێ:

﴿٣٦﴾ خۆ بۆ لای خەڵکی مەدیەنیش شوعەیبی برایانمان ڕەوانەکرد، جا ئەویش بە گەلەکەی وت: الله بپەرستن و لە هاتنی ڕۆژی دوایی بترسن و خراپەکارانە لە زەویدا خراپە بڵاو مەکەنەوە.

﴿٣٧﴾ ئەوسا ئەوان باوەڕیان پێ نەکرد، جا لەرزەیەکی وا گرتنی کە لەناو ماڵی خۆیاندا چەن و مل کەوتن و هەستو خوستیان لێ بڕاو کەسیان دەرنەچون. ئینجا دێتە سەر باسی عادو سەمود بە کورتی و دەفەرموێ:

﴿٣٨﴾ خۆ عادی گەلی هود و سەمودی گەلی صالحیشمان لەناو برد بەڕاستی جێگاو ڕێگای ئەوان کەبەناویاندا هاتوچۆ دەکەن ئەوراستیەی بۆ ڕۆشن کردونەتەوەو بەچاوی خۆتان دەی بینن، شەیتان کرداره خراپو نا لەبارەکانیانی بۆ جوانکردبون و ڕێگای ڕاستی لێ گرتبون، خۆحەق و ناحەقیشیان بە باشی دەناسی بەڵام دوای هەواو ئارەزۆ کەوتن تا بەو ڕۆژە ڕەشە گەیشتن.

﴿٣٩﴾ جا قارون و فیرعەون و هامانیشمان لەناوبرد، بەڕاستی موسا بە چەندین بەڵگەی ڕۆشن هاتبوە لایان کەچی ئەوان لەم زەویەدا خۆیان بە گەورە گرت و نەیشیان توانی لە دەستمان دەربچن، بەڵکو هەمویان بە ناچاری گەڕانەوە لای الله جا ئەوان لە دنیادا هەر یەکەی بەشێوە سزایەك لەناوبران وەکو دەفەرموێ:

﴿٤٠﴾ ئەوسا هەریەك لەوانمان بە تاوانی خۆی گرت، جا هەندێکمان بەرد باران کرد وەك گەلی لووت و هەندێکیان بە دەنگێکی توند کە ڕەگی دڵی پارچە پارچە کردن لەناوچوون وەك گەلی سەمودو هەندێکی تریان بە ناخی زەویدا

وَقَٰرُونَ وَفِرْعَوْنَ وَهَٰمَٰنَ ۖ وَلَقَدْ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا كَانُوا۟ سَٰبِقِينَ ﴿٣٩﴾ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنۢبِهِۦ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَا ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مِن شَىْءٍ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٤٢﴾ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٤﴾ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ ۖ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ ۗ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ ﴿٤٥﴾

بردماننە خوارەوە وەکو قارونو هەندێکی ترمان بە ئاو خنکاند وەك گەلی نوحو فیرعەونو دەستو پێوەندەکەی، جا ﷲ ستەمی لەوان نەکرد بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد.

﴿٤١﴾ وێنەی ئەو کەسانەی کە جگە لە ﷲ دۆستانێك دەگرن کە یارمەتیان بداتو لە سزای ﷲ ڕزگاریان بکات، وەك ئەو جاڵجاڵۆکەیە کە ماڵێك بۆ پاراستنی خۆی دروست دەکات کە بێگومان لاوازترین ماڵ ماڵی جاڵجاڵۆکەیە ئەگەر بزانن. واتە وێنەی ئەوان لەهیچو پوچیو لاوازیدا وێنەی ئەو جاڵجاڵۆکەیە.

﴿٤٢﴾ بەبێگومان کە ﷲ دەزانی بەو شتەی کە جگە لەخۆی دەیپەرستن، وە هەر خۆیەتی تواناو کار بەجێ.

﴿٤٣﴾ جا ئەوانە وێنە گەلێکن کە ئێمە دەیهێنینەوە بۆ خەڵكو جگە لە زانایان لێیان تێناگەن.

﴿٤٤﴾ ﷲ ئاسمانانو زەوی بۆ مەبەستێکی ڕاست دروستکردوە، بەڕاستی لەودا بەڵگەیەکی گەورە هەیە بۆ باوەڕداران.

﴿٤٥﴾ ئەوەی بۆت هاتووە لەم پەڕاوەدا بیخوێنەوەو بە خەڵکی ڕابگەیەنەو هەستە بە داخوازیەکانی نوێژو ئەنجامی بدە، بەڕاستی نوێژ بەرگری دەکات لە داوێن پیسیو ئیشی ناڕەوا، جا بە دڵنیاییەوە یادی ﷲ لە هەمو شت گەورەترە، خۆ ﷲ دەزانێت کە چ کارو پیشەیەك ئەنجام دەدەن.

لە فەرمودەیکی قودسیدا هاتوە کە پەروەردگار فەرمویەتی:
{ إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ / متفق عليه/ هەر کەسێك لە دڵی خۆیدا یادم بکات منیش لە دڵی خۆمدا یادی دەکەم، وە هەر کەسێکیش لەناو کۆمەڵێکدا یادم بکات من لەناو کۆمەڵێکی چاکتر لەوان یادی دەکەم) ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٤٦﴾ بە شێوەیەکی جوانتر نەبێت لەگەل ئەهلی کیتابدا وتوێژ مەکە جگە لەوانەیان کە ستەمیان کردوە، وە بڵێن ئێمە بەوەی کە ڕەوانەکراوە بۆ لامانو ئەوەیش کە ڕەوانەکراوە بۆلای ئێوە باوەڕمان هێناوەو پەرستراوی ئێمەو پەرستراوی ئێوە یەکەو ئێمە هەر بۆ ئەو گەردنکەچین.

﴿٤٧﴾ هەر بەو شێوەی کە پەڕاومان ناردوە بۆ گەلانی پێشوو هەرواش ئەم قورئانەمان نارده لای تۆ، جا ئەوانەی کە پەڕاومان پێدابون بەم قورئانە باوەڕدەهێنن، چونکە دەزانن ڕاستەو لەلایەن ﷲوە هاتوە. وەکو زانای پایە بەرزی جولەکە عەبدوڵای کوڕی سەلامو ناوداری ناسراو سەلمانی فارسیو وێنەکانیان خۆ لەناو ئەم گەلەی تۆشدا کەسانێك هەن کە باوەڕی پێدەکەن، ئەوساجگە لە خوا نەناسان هیچ کەسێکی تر نکولی لە ئایەتەکانی ئێمە ناکات.

۞ وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَۚ فَٱلَّذِينَ ءَاتَيۡنَٰهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ يُؤۡمِنُونَ بِهِۦۖ وَمِنۡ هَٰٓؤُلَآءِ مَن يُؤۡمِنُ بِهِۦۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٧﴾ وَمَا كُنتَ تَتۡلُواْ مِن قَبۡلِهِۦ مِن كِتَٰبٖ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَۖ إِذٗا لَّٱرۡتَابَ ٱلۡمُبۡطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلۡ هُوَ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ فِي صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَآ أُنزِلَ عَلَيۡهِ ءَايَٰتٞ مِّن رَّبِّهِۦۖ قُلۡ إِنَّمَا ٱلۡأٓيَٰتُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ أَوَلَمۡ يَكۡفِهِمۡ أَنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَرَحۡمَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾ قُلۡ كَفَىٰ بِٱللَّهِ بَيۡنِي وَبَيۡنَكُمۡ شَهِيدٗاۖ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ وَكَفَرُواْ بِٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿٥٢﴾

﴿٤٨﴾ تۆ له پێش ئەم قورئانەدا هیچ پەڕاوێكت نەخوێندوەتەوە، وە به دەستت هیچ شتێكیشت نەنوسیوه، ئەگەر تۆخوێندەوار بویتایەو نوسینت بزانیایه بێهودەكارو ساختەچییان لەم قورئانەدا دەكەوتنە گومانەوە، بەڵام ئیستا سەبارەت بەراستیو دروستی ئەم قورئانه جێی هیچ گومانێك بۆ مروڤی ژیرو زانا نەماوه.

﴿٤٩﴾ نەخێر ئەوانە لەسەر بیروڕایەكی هەڵەن ئەم قورئانه ئایەت گەلێكی ڕۆشنن له دڵی ئەوانەی كه خاوەنی زانستو زانیارین، وە جگه له ستەمكاران هیچ كەسێكی تر نیه كه نكولی له ئایەتەكانی ئێمەدا بكات.

﴿٥٠﴾ وه بێ بڕوایان دەیان وت: دەبا چەند موعجیزەیەك له پەروەردگاریەوە دابەزێتە سەری، بڵێ: موعجیزەكان لەلایەن اللَّهیەو بە دەست ئەوەو من تەنها ترسێنەرێكی ئاشكرامو ئیشی من هەر ئەوەیه.

﴿٥١﴾ ئایا ئەوە بەس نیە بۆیان كە ئێمە ئەم قورئانە پڕ له زانایی‌و داناییەمان ناردووەتە لای تۆی نەخوێندەوار كه دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا؟ بێگومان لەم قورئانەدا خەیرو بەزەیی‌و پەندو ئامۆژگاری هەیه بۆ ئەوانەی كه باوەڕ دەهێنن.

﴿٥٢﴾ بڵێ: اللَّه بەسە كە له نێوان منو ئێوەدا شایەت بێت لەسەر ڕاستی منو ئەو قورئانە، ئەو بەوەی كە له ئاسمانانو زەویدا هەیە دەزانێت، جا ئەوانەی كه بە شتی پڕو پوچ باوەڕیان هێناوەو بە اللَّه بێباوەڕن هەر ئەوانەن دۆڕاوو ڕەنجەڕۆ.

﴿٥٣﴾ جا ئەوان داوات لێ دەكەن كە ئەو سزاو تۆڵەیەی كە باسی دەكەیت بە پەلە بێتە سەریان خۆ ئەگەر ماوەی دیاری نەبوایە بە دڵنیاییەوە ئەو سزایان بۆ دەهات، وەبەدڵنیاییەوە بەشێوەیەك كە ئەوان هەست پێ نەكەن ئەو سزایە یان بۆ دێت.

﴿٥٤﴾ داوات لێ دەكەن با بەپەلە ئەو سزایە بێت لەحاڵێكدا كە دۆزەخ گەمارۆی خوانەناسانی داوە. بەبێگومان دەكەونە ناویەوە، جا ئەگەر ژیربن چۆن داوای شتی وادەكەن.

﴿٥٥﴾ له ڕۆژێكدا كە ئەو سزایە لەسەریانەوەو لەژێریانەوە دایان دەپۆشێت، جا پێیان دەفەرموێ: دەسا بچەژن سزای ئەوەی كە كردو تانە.

ئینجا اللَّه ڕوو لەو بەندانەی كە ناتوانن لە جێگاو ڕێگای خۆیاندا ئایینەكەیان ببەن بەڕێوە دەكات و دەفەرموێ:

﴿٥٦﴾ ئەی ئەوبەندانەم كە باوەڕتان هێناوە بەڕاستی زەوی من فرەوانە ئەوسا تەنها بەندایەتی بۆمن بكەنو بە جگە لەرێبازی من ڕازی مەبن جا ئەگەر لە جێو ڕێی خۆتاندا بۆتان نەكرا كۆچ بكەنو له مردن مەترسن چونكە،

وَيَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ وَلَوۡلَآ أَجَلٞ مُّسَمّٗى لَّجَآءَهُمُ ٱلۡعَذَابُ
وَلَيَأۡتِيَنَّهُم بَغۡتَةٗ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٥٣﴾ يَسۡتَعۡجِلُونَكَ بِٱلۡعَذَابِ
وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٥٤﴾ يَوۡمَ يَغۡشَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ
مِن فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۡ وَيَقُولُ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ
﴿٥٥﴾ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ أَرۡضِي وَٰسِعَةٞ فَإِيَّٰيَ فَٱعۡبُدُونِ
﴿٥٦﴾ كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۖ ثُمَّ إِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ
ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَنُبَوِّئَنَّهُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ غُرَفٗا تَجۡرِي
مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ نِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٥٨﴾ ٱلَّذِينَ
صَبَرُواْ وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٥٩﴾ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٖ لَّا تَحۡمِلُ
رِزۡقَهَا ٱللَّهُ يَرۡزُقُهَا وَإِيَّاكُمۡۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ وَلَئِن
سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۖ فَأَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ
عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿٦٢﴾ وَلَئِن سَأَلۡتَهُم
مَّن نَّزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَأَحۡيَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ مِنۢ بَعۡدِ مَوۡتِهَا
لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ قُلِ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٣﴾

﴿٥٧﴾ هەمو گیان لەبەرێك دەبێت بمرێت پاشان هەر بۆلای خۆمان دەتانهێننەوە.

﴿٥٨﴾ جا ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوەو كردار گەلی چاكیان ئەنجام داوە، بەڕاستی لە چەند ژورێكی ناو بەهەشتدا كە لە ژێریاندا چەندین ڕوبار تێدەپەڕێت جێگەیان دەكەینەوە لە حاڵێكدا بۆ هەمیشە لەناویدا دەمێننەوە، ئای چەند چاكە پاداشتی خەباتكاروتێكۆشەران. جا ئەوانە كێن؟

﴿٥٩﴾ ئەو كەسانەن كە لەسەر ئایینو بەندایەتیو ئێشو ئازارەكانی خۆیان گرتوەو هەر بە پەروەردگاریان پشتیان بەستوە، ئا بۆ ئەوانەیە ئەو خەڵاتە بەرێزە.

﴿٦٠﴾ خۆ زۆرێك لەو جانەوەرانەی كە بەسەر زەویدا دەگەڕێت ڕۆزی خۆی هەڵناگرێت، ﷲ ڕۆزی بەئەوو بە ئێوەش دەدات، جا هەر ئەوە بیسەری هەمو قسەو زانەری هەمو كردارتانە. واتە: نەكەن لە ترسی مردنو ڕۆزی كۆچ نەكەن چونكە هەمو كەس دەبێت لەكاتی دیاری خۆیدا بمرێت، وە ڕۆزیدەریش هەر ﷲ یە و بێئاگا نیە لەدروستكراوەكانی لە هەركوێدا ببن.

﴿٦١﴾ خۆ ئەگەر پرسیاریان لێ بكەیت كە كێ ئاسمانانو زەوی دروستكردوەو كێ خۆرو مانگی بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ ملكەچ كردوە؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێن: ﷲ، دەسا چۆن ئەوان لەو ڕاستیە لادەدرێنو هاوەڵ بۆ ﷲ دادەنێن؟!

﴿٦٢﴾ ﷲیە كە ڕۆزی فرەوان دەكات بۆ كەسێك كە ئارەزوی لێ بێت لە بەندەكانیو هەر ئەویشە تەنگی دەكاتەوە لێی، بەڕاستی ﷲ زانیاری وردی هەیە لەسەرهەمو شتێك.

﴿٦٣﴾ جا ئەگەر پرسیاریان لێ بكەیت كە كێ لە ئاسمانەوە باران دەبارێنێت، جا بە هۆی ئەو بارانەوە زەوی پاش ئەوەی وشكو بێ گژوگیایە زیندوو دەكاتەوە؟ بە دڵنیاییەوە دەڵێن: ﷲ، بڵێ: تەواوی سوپاس هەربۆ ﷲیە، بەڵام زۆربەیان شت فێرنابنو بەم هەمو بەڵگەیە لەوە تێناگەن كە ئە بێ هەر ئەو زاتە بپەرستن، چونكە سەردارو سەرپەرشتی هەمو شت هەر ئەوە.

﴿٦٤﴾ ئەم ژیانەی دنیا جگە لە گاڵتەو گەمە شتێكی تر نیە، بەڕاستی هەرماڵی دواڕۆژە كە جێی ژیانە ئەگەر ئەوان بزانن، چونكە ئەو ماڵی دواڕۆژە بە پێچەوانەی ماڵو ژیانی دنیایە ژیانێكی هەمیشەییەو نەداریو نخۆشیو مردنی تیدا نیە.

﴿٦٥﴾ جا هەر كاتێك كە سواری كەشتی دەبن بە پاڵفتەیو بێ غەلوغەش لە ﷲ دەپاڕێنەوەو خۆیان بۆی یەكلا دەكەنەوە، خۆ كاتێكیش كە ڕزگاری دەبنو دەگەنە وشكانی كتوپڕ هاوبەش بۆ ﷲ دادەنێن؟!

وَمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا لَهْوٌ وَلَعِبٌ ۚ وَإِنَّ ٱلدَّارَ ٱلْءَاخِرَةَ لَهِىَ ٱلْحَيَوَانُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٦٤﴾ فَإِذَا رَكِبُوا۟ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ ﴿٦٥﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ وَلِيَتَمَتَّعُوا۟ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّا جَعَلْنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنْ حَوْلِهِمْ ۚ أَفَبِٱلْبَٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَكْفُرُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِٱلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ وَٱلَّذِينَ جَٰهَدُوا۟ فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا ۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ لَمَعَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٦٩﴾

٣٠ سُورَةُ الرُّومِ ٦٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدْنَى ٱلْأَرْضِ وَهُم مِّنۢ بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ ﴿٣﴾ فِى بِضْعِ سِنِينَ ۗ لِلَّهِ ٱلْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِنۢ بَعْدُ ۚ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿٤﴾ بِنَصْرِ ٱللَّهِ ۚ يَنصُرُ مَن يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾

(٦٦) تا سەر ئەنجام بێباوەڕو ناسوپاس بن بەوەی کەپێمان داون، سا با لەم دنیایەدا ڕابوێرن بەم زوانە دەزانن چییان کردووەو چیان لێ دەکرێت

(٦٧) ئایا نابینن کە (مەکە)مان کردوە بە جێگای ئەمنو ئاسایش لە حاڵێکدا کە خەڵکی لە چواردەوری ئەوان دەفڕێنرێن وهیچ ئەمنو ئاسایشێکیان نیە، دەی ئایا بە شتی پڕوپوچ باوەڕ دەهێننو بە نیعمەتی ﷲ بێباوەڕو ناسوپاسن؟

(٦٨) جا کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە درۆی بە دەمی ﷲوە کرد بێ یان باوەڕی بەو ڕاستیە نەکرد بێت کاتێ کە هاتوتە لای؟ ئایا لە دۆزەخدا جێگای کافران نیە؟ واتە: بۆ کوێ دەچن مادام باوەڕ نەهێنن جێی ئەوان هەر دۆزەخە.

(٦٩) جا ئەو کەسانەی کە خەباتیان لەپێناو ئێمەدا کردوە بەڕاستی ئێمەیش شارەزای هەمو بەشەکانی ئەم ئایینەی خۆمانی دەکەین، چونکە چاکەکارەو ﷲیش لەگەڵ چاکەکاراندایە و یارمەتیان دەداتو کردارەکانیان لێ وەردەگرێت.

وە ئەمە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە ئەهلی جیهادو تیکوشان شایستەترین کەسانێکن بەم هیدایەتو ڕێنماییە لە لایان ﷲەوە.

پێغەمبەر ﷺ لە پێناسەی ئیحسان دا دەفەرموێ:{ أَنْ تَعْبُدَ اللَّهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ / متفق عليه/ ئیحسان ئەوەیە کە بە شێوەیەك بەندایەتی ﷲ بکەیت وەك ئەوەی ببیبینیت، جا ئەگەر تۆ ئەو نابینیت ئەو تۆ دەبینێت}

٣٠ سورەتی روم ٦٠

ئەم سورەتە کە سورەتی سیهەمی قورئانە، شەست ئایەتە، لەمەکەدا هاتوتەخوارەوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی هەشتاو چوارەمەو پاش سورەتی (الانشقاق)و پێش (العنكبوت) دابەزیوە. ئەم سورەتە هەروەك سورەتی پێشوی کە سورەتی عەنکەبوتە بە ﴿ الٓمٓ ﴾ دەست پێدەکات بەڵام لە هەمو سورەتەکاندا کە بە پیتە جیاجیاکان (الحروف المقطعة) دەست پێدەکەن پاش ئەم پیتانە باسی قورئان هاتوە جگە لەم سورەتەو سورەتی پێشوی، وە هەروەها سورەتی قەڵەم، ئەم سورەتە هەر لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بە سورەتی ڕۆم ناوبراوە، وشەی (الروم) لە قورئاندا تەنها یەکجار ئەویش لەم سورەتەدا هاتوە، وتراوە لە ساڵی شەشسەدوبیستی زاینی لە نێوان ڕۆم وفارسەکاندا کە دوو زلهێزی ئەو سەردەمە بون شەڕو لەیەکدانێکی وا ڕوی دا کە ڕۆمی بەرەو نەمان برد، جا کەسێك گومانی نەدەکرد کە بۆ جارێکی تر ڕۆمیەکان بتوانن دەسەڵاتی خۆیان بە دەست بهێنن بەڵام هەرلەو سەردەمەدا قورئان باسی ئەم ڕوداوەی کردو پێش بینی ئەوەیشی کرد کە پاش چەند ساڵێك ڕۆمیەکان زاڵ دەبنەوە بە سەر فارسەکاندا دیارە لەدوای ئەو تێکشانە گەورەی ڕۆمیەکان، هیچ کەس گومانی ئەمەی نەدەکرد، جا بۆیە بێباوەڕانی مەکە دەستیان کرد بەگەمەو گاڵتە پێکردنی قورئان بەڵام لە دوای حەوت ساڵ لەو ڕوداوە ئەوەی کە قورئان باسی لێکردبو هاتە دیو ڕۆمەکان توانیان بەسەر فارسەکاندا سەرکەونو ئەوەی کە بێباوەڕان بە هەلێکیان دەزانی بۆ ڕەخنەگرتن لە قورئان بو بە بەڵگەیەکی تر لە سەر ڕاستی ئەم قورئانەو زیادبونی ئیمان لە نێو دڵی باوەڕداراندا.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١)(٢) الیف، لام، میم. ڕۆمەکان شکێنران

(٣) لە نزمترین زەویدا، بەڵام بەم زوانە سەردەکەونەوە. ڕۆمەکان خاوەنی پەڕاو بون بەڵام فارسەکان بت پەرست بون بۆیە بت پەرستانی مەکە شادمان بونو وتیان: ئێمەیش بەسەر ئێوەدا زاڵ دەبین جا ئەم ئایەتە کەباس لە سەرکەوتنی ڕۆمەکان دەکات دابەزیو مژدەیەك بو بۆ باوەڕداران.

﴿٤﴾ لە ماوەی کەمتر لە دە ساڵدا سەردەکەون، وە هەر بە دەست ﷲ یە هەمو کاروبار لە پێش سەرکەوتنی رۆمەکانو لە پاش سەرکەوتنیشیاندا، هەموی بەئارەزۆو ویستی ﷲ بوە.

وشەی ﴿بِضۡعِ﴾ لە سێوەیە تاکو دە. جا کاتێك کە ئەم ئایەتە دابەزی ئەبوبەکر دەرچوو دەگەڕا بەدەوری مەکەداو هاواری دەکرد بە خوێندنەوەی ئەم ئایەتە، هەندێك لە بت پەرستان بە ئەبوبەکریان وت: جائەمە با لەنێوان ئێمەو ئێوەدا بێت، ڕەفیقەکەتان وا گومان دەبات کە رۆم لە ماوەی چەند ساڵێکی تردا بەسەر فارسەکاندا سەردەکەون! ئایا نایەیت کە گرەوێك بکەین لەسەری؟ وتی: بەڵێ: ئامادەم جا ئەمە پێش قەدەغە بونی قومار بوە، ئینجا لەگەڵ ئەبوبەکردا گرەویان کردو وتیان:

﴿بِضۡعِ﴾ لە سێوەیە تا نۆ ساڵ با لەنێوان ئەوەدا شتێك دیاری بکەین جا شەش ساڵیان دانا، شەش ساڵ ڕۆیی پێش ئەوەی کە سەربکەونو بت پەرستەکان گرەوەکەیان لە ئەبوبەکر وەرگرتو ساڵی حەوتەم رۆمەکان سەرکەوتن، جا موسڵمانەکان ڕەخنەیان لە ئەبوبەکر گرت لەسەر ناوبردنی شەش ساڵ، وتیان: چونکە ﷲ فەرمویەتی ﴿فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾ /الترمذي، حسنه الألباني/ لەنێوان چەند ساڵێکدا) دەڵێ: لەو کاتەدا خەڵکێکی زۆر موسڵمان بون، پەروەردگار دەفەرموێ:جا ئەو ڕۆژە باوەڕداران شادمان دەبن،

﴿٥﴾ بەو یارمەتیەی ﷲ، کە ئارەزۆی یارمەتی هەر کەسی ببێت دەیکاتو سەری دەخات.

﴿٦﴾ ئەمە بەڵێنی ﷲیەو ﷲ بەڵێنی خۆی دەباتە سەر بەڵام زۆربەی خەڵك ئەم راستیە نازانن.

﴿٧﴾ لە ڕواڵەتی ژیانی دنیا ئاگادارن بەڵام ئەوان لە ژیانی دوارۆژ بێ ئاگان.

﴿٨﴾ ئایا بیر لە خۆیان ناکەنەوە کە چۆن دروستکراون؟ ﷲ ئاسمانانو زەویو ئەوەی نێوانیانی تەنها بۆ مەبەستێکی ڕاست وبۆ ماوەیەکی دیاریکراو دروستکردوە، بەڕاستی زۆربەی خەڵك بە گەیشتن بە پەروەردگاریانو حیسابو کیتاب بێباوەڕن، بەڵام ئەم بێباوەڕیە هیچ گۆڕانکاریەك بەسەر بڕیاری ﷲدا ناهێنێتو هەمو بڕیارێکی لەجێگاو کاتی خۆیدا دێتە دی.

﴿٩﴾ ئایا نەگەڕاون بە ناو ئەم زەویداو ورد ببنەوەو بزانن سەر ئەنجامی ئەوانەی پێش ئەوان چۆن بوەو چییان بەسەر هاتوە؟ کە ئەوان لە تواناییدا لەوان بەهێزتر بونو زەوییان کێڵاوەو زیاتر لەوانیش ئاوەدانیان کردوەتەوەو پێغەمبەرانیان بە بەڵگە گەلێکی ڕونەوە هاتبونە لایان، جا ئەوان بە درۆیان خستنەوەو

وَعۡدَ ٱللَّهِۖ لَا يُخۡلِفُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعۡلَمُونَ ظَٰهِرٗا مِّنَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَهُمۡ عَنِ ٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمۡ يَتَفَكَّرُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۗ مَّا خَلَقَ ٱللَّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَآ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَأَجَلٖ مُّسَمّٗىۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ بِلِقَآيِٕ رَبِّهِمۡ لَكَٰفِرُونَ ﴿٨﴾ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُوٓاْ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَأَثَارُواْ ٱلۡأَرۡضَ وَعَمَرُوهَآ أَكۡثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَآءَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٩﴾ ثُمَّ كَانَ عَٰقِبَةَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ ٱلسُّوٓأَىٰٓ أَن كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ بِهَا يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿١٠﴾ ٱللَّهُ يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُبۡلِسُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿١٢﴾ وَلَمۡ يَكُن لَّهُم مِّن شُرَكَآئِهِمۡ شُفَعَٰٓؤُاْ وَكَانُواْ بِشُرَكَآئِهِمۡ كَٰفِرِينَ ﴿١٣﴾ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوۡمَئِذٖ يَتَفَرَّقُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَهُمۡ فِي رَوۡضَةٖ يُحۡبَرُونَ ﴿١٥﴾

پاشان تۆڵەیان لێ سەندرا، جا خوﷲ هیچ ستەمێکی لێ نەکردن بەڵام ئەوان خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردبو، واتە: ژیر بنو لەوانە پەند وەرگرن با وەك ئەوانتان بەسەر نەیەت.

﴿١٠﴾ پاشان سەرئەنجامی ئەو کەسانەی کە خراپە کێڵ بون دوچاری سزای خراپتر لەوە بون کە کردیان، چونکە ئەوان بێباوەڕ بون بە ئایەتەکانی ﷲو گاڵتەیان پێدەکرد.

﴿١١﴾ هەر ﷲیە لەسەرەتاوە خەڵك دروست دەکات، پاشان پاش مەرگ زیندویان دەکاتەوەو پاشان هەر بۆ لای ئەویش دەتان گێڕنەوە.

﴿١٢﴾ جا کاتێك کەقیامەت هات تاوانباران نائومێدو مەئیوس دەبنو هیچ بەڵگەیەکیان بۆ وتن پێ نامێنێتو سەرشۆڕو داماودەبن.

﴿١٣﴾ خۆ لەناو ئەو شەریکانەی کە کردویانن بە هاوبەش بۆ ﷲو چاوەڕوانی شەفاعەتیان لێدەکردن هیچ شەفاعەتکەرو تکاکارێکیان بۆ نیە بەڵکو لە هاوبەش بونیشیان نکۆڵی دەکەن، ئەوەیە سەر ئەنجامی ئەوانەی کە پەیڕەوی جگە لە ﷲ دەکەن.

﴿١٤﴾ جا کاتێك کەقیامەت هات هەر لەو ڕۆژەدا بەش بەش دەبنو چاکەکارانو خراپەکاران لەیەك جیا دەبنەوە.

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَلِقَآيِٕ ٱلۡأٓخِرَةِ فَأُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿١٦﴾ فَسُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ حِينَ تُمۡسُونَ وَحِينَ تُصۡبِحُونَ ﴿١٧﴾ وَلَهُ ٱلۡحَمۡدُ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَعَشِيّٗا وَحِينَ تُظۡهِرُونَ ﴿١٨﴾ يُخۡرِجُ ٱلۡحَيَّ مِنَ ٱلۡمَيِّتِ وَيُخۡرِجُ ٱلۡمَيِّتَ مِنَ ٱلۡحَيِّ وَيُحۡيِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ وَكَذَٰلِكَ تُخۡرَجُونَ ﴿١٩﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ إِذَآ أَنتُم بَشَرٞ تَنتَشِرُونَ ﴿٢٠﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنۡ خَلَقَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا لِّتَسۡكُنُوٓاْ إِلَيۡهَا وَجَعَلَ بَيۡنَكُم مَّوَدَّةٗ وَرَحۡمَةًۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱخۡتِلَٰفُ أَلۡسِنَتِكُمۡ وَأَلۡوَٰنِكُمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّلۡعَٰلِمِينَ ﴿٢٢﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ مَنَامُكُم بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَٱبۡتِغَآؤُكُم مِّن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَسۡمَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ يُرِيكُمُ ٱلۡبَرۡقَ خَوۡفٗا وَطَمَعٗا وَيُنَزِّلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ فَيُحۡيِۦ بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٢٤﴾

﴿١٥﴾ جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە ئا ئەوانە لە ناو باخچەی بەهەشتدا شادمانو کەیفخۆش دەکرێن.

﴿١٦﴾ جا ئەوانەیش کە کافر بونو باوەڕیان بە ئایەتەکانی ئێمەو گەیشتن بە دواڕۆژیان نەبوە ئەوسا ئەوانە لەناو سزای توندو بەژاندا ئامادە دەکرێن.

﴿١٧﴾ سا پاکو بێگەردی بۆ اللهیە ئەو کاتەی کە ئێوارە دەکەنەوەو کاتێك کە بەیانی دەکەنەوە. واتە هەموکات، دەی ئێوەش تەسبیحاتی الله بکەن بەتایبەت لەو دوو کاتەدا و بەپاکی ناوی ببەن.

﴿١٨﴾ جا تەواوی سوپاس هەر بۆ ئەو زاتەیە لە ناو ئاسمانانو زەویداو ئێوارانو کاتی نیوەڕوانتان. جا لەوکاتانەدا زیکری (سبحان الله و الحمدلله) بەزمان چاکەو پاداشتی زۆرە.

﴿١٩﴾ هەر ئەو زاتەیە زیندو لە مردو دروست دەکاتو مردویش لە زیندو دروست دەکاتو زەوی پاش وشکیو بێ گژوگیای بە ئاوو گژوگیا زیندوو دەکاتەوە، هەر ئاوایش ئێوە لە گۆڕەکانتان دەردەهێنرێنو زیندو دەکرێنەوە.

﴿٢٠﴾ جا هەندێك لە بەڵگەکانی دەسەڵاتو هێزی الله ئەوەیە کە ئێوەی لە سەرەتادا لە خاك دروستکرد کە ئادەمی باپیرەتانەو پاشان ئێوەئەم مرۆڤەن کە لەم جیهانەدا پەرتو بڵاو دەبنەوە.

﴿٢١﴾ هەم لە نیشانەکانی زانایيو دەسەڵاتی الله ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەری بۆ دروستکردون تا بەهۆی ئەوانەوە بحەسێنەوە، وەلە نێوانتاندا خۆشەویستیو سۆزی داناوە تا پێکەوە بە خۆشیو کامەرانی ژیان ببەنە سەر، بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە بیربکاتەوە.

﴿٢٢﴾ وە لە نیشانەکانی الله دروستکردنی ئاسمانانو زەویو جیاوازی زمانو ڕەنگتانە، بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە زانا بن.

﴿٢٣﴾ وە هەر لە نیشانەکانی دەسەڵاتو هێزو زانایی الله چۆنیەتی خەوەکانی شەوو ڕۆژتانە کە دە بێ بە هۆی ئاسودەیيو حەسانەوەتانو هەوڵو کۆششتان بۆ بەدەست هێنانی خێرو بەرەکەتی ئەو، بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەو گەلەی کەگوێدەگرنو دەبیسنو وەردەگرن.

﴿٢٤﴾ خۆ هەر لە نیشانەکانی دەسەڵاتو قودرەتی ئەوە کە بروسکەتان پیشان دەدات کە ترسی سزای لێ دەکەنو چاوەڕێی خێرو بەرەکەتیشن، وە لە ئاسمانەوە ئاوتان بۆ دەنێرێت جا بەو ئاوە زەوی پاش مردنی بە گژوگیاو ڕوباروکانیاوەکان زیندو دەکاتەوە، بەڕاستی لەوەشدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە تێدەگەنو ژیری خۆیان پشتگوێ ناخەن.

﴿٢٥﴾ وە لە نیشانەکانی تری دەسەڵاتو گەورەیيو دانایيالله یە کە ئاسمانو زەوی بە فەرمانی ئەو وەستاون، ئیتر پاش بینینی ئەم نیشانانە بەچاوی خۆتان جا بزانن کە هەر ئەو زاتە دەتوانێت هەر کاتێك لە ناو زەویدا یەکجار بانگتان بکات بۆ زیندوبونەوە پاش مردن بەکتوپڕی زیندو دەبنەوەو لە گۆڕەکانتان دێنە دەرەوە بۆ مەیدانی مەحشەر.

﴿٢٦﴾ جا ئەوەی لە ئاسمانانو زەویدایە هەموی هەرموڵکی ئەوەو هەمویشیان ڕامو گەردنکەچی بڕیاری ئەونو ناتوانن لە دەستی حیسابو کیتابی ئەو دەربچن.

﴿٢٧﴾ خۆ ئەو هەر خۆیەتی کە لە سەرەتاوە مرۆڤ دروست دەکاتو پاشان پاش مردنیش زیندوی دەکاتەوە، جا ئەو زیندو کردنەوە ئاسانترە لەلای لە دروستکردنی سەرەتایی، سا وێنەو وەسفی بەرزتر لە ئاسمانانو زەویدا هەر بۆ ئەوە و هەر ئەو خۆیەتی بە دەسەڵاتو دانا.

﴿٢٨﴾ الله لە نەفسی خۆتاندا وێنەیەکتان بۆ دەهێنێتەوە تا بیری لێ بکەنەوەو پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بەندانەی کە خۆتان بەدەستتان هێناوە ئایا دەیانکەن بە

هاوبەشی خۆتان لەو ماڵەی کە ئێمە پێمان داون، جا ئێوەو ئەوان لەوەدا یەکسان بن، وە ئایا هەر وەك چۆن لەناو خۆتاندا لە یەکتر دەترسن ئاوا لەوانیش دەترسن؟ دیارە ئەوان چونکە مولکی ئێوەن نایان کەن بە شەریکی خۆتان ئەی کەی ڕەوایە لەمولکی ﷲ شتانێك بکەن بە هاوەڵو هاوبەش بۆ ﷲو بەندایەتیان بۆ بکەنو فەرمانەکانیان جێ بەجێ بکەن؟!ئینجا دەفەرموێ: هەر ئاوەها ئێمە نیشانەکانی خۆمان ڕۆشن دەکەینەوە بۆ ئەو گەلەی کە تێ بگاتو ژیریان بەکار بهێنن.

(٢٩) بەڵام ئەوانەی کە ستەمکارن پەیڕەوی هەواو هەوەسی خۆیان دەکەن بە بێ ئەوەی کە هیچیش بزانن، جا کێ هەیە کە ڕێنمایی ئەو کەسە بکات کە بەهۆی خراپەی خۆیەوە ﷲ سەری لێ تێکداوە لە حاڵێکدا بۆ ئەوان هیچ یارمەتیدەرێکیش نیە؟

(٣٠) ئینجا ئەی پێغەمبەرﷺ تۆ هەمیشە هەر ڕوو لەم ئایین بکەو ڕوو لە هەمو ئایینەکانی تر وەرچەرخێنەو پەیڕەوی ئەوئایینەی ﷲ بکە کە مرۆڤی لە بنەڕەتدا لەسەر ئەو بیرو باوەڕە دروستکردوەو بۆ ئەو ئایینەشی دروستکردونو هیچ گۆڕانکاریەکیش بە سەر دروستکردنی ﷲدا نایەت کە هەر ئەوەیشە ڕێبازو ئایینی ڕاست بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:{ مَا مِنْ مَوْلُودٍ إِلَّا يُولَدُ عَلَى الْفِطْرَةِ فَأَبَوَاهُ يُهَوِّدَانِهِ أَوْ يُنَصِّرَانِهِ أَوْ يُمَجِّسَانِهِ كَمَا تُنْتَجُ الْبَهِيمَةُ بَهِيمَةً جَدعَاءَ هَلْ تُحِسُّونَ فِيهَا مِنْ جَدْعَاءَ في رواية(حَتَّى تَكُونُوا أنتم تجدعونها /متفق عليه/ هیچ کەسێك لە دایك نا بێ مەگەر لەسەر فیترەت، جا باوكو دایکی دەیکەن بە جولەکە یان بە گاور یان بە ئاگرپەرست، هەروەکو لە گیانداران بەچکەکانیان بە بێگەرد لەدایك دەبن ئایا دەبینن لە ناو ئەواندا لوتو گوێ هەڵبچڕاوێکیان تێدا بێت؟ هەتا ئێوە لە پاشدا لوتو گوێیان دەبڕن }

وتیان: ئەی پێغەمبەرﷺ ئەی ئەو کەسەی هەر بە منداڵی دەمرێت چۆنە؟ فەرموی {اللّهُ أعلَمُ بِمَا كَانُوا عَامِلِين/ابوداود.صححه الالباني/ ﷲ دەزانێت کە چی دەکن } دیارە ئەو منداڵانە کە دەچنە بەهەشت بێگومان دەبێ باوەردار بن چونکە لە فەرمودەدا هاتوەکە:{ لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ إِلَّا نَفْسٌ مُؤْمِنَةٌ /النسائي، صححه الالباني/ جگە لەباوەڕدارهیچ کەس ناچێتە بهەشتەوە}.

وە ئەمە بە گوێری باوەڕداربون یان نەبونی دایك و باوك نیە چونکە پێغەمبەرﷺ لە باسی ئەو خەونەی کە بینیویەتی دەفەرموی:{وَأَمَّا الرَّجُلُ الطَّوِيلُ الَّذِي فِي الرَّوْضَةِ فَإِنَّهُ إِبْرَاهِيمُ عليه السلام وَأَمَّا الْوِلْدَانُ الَّذِينَ حَوْلَهُ فَكُلُّ مَوْلُودٍ مَاتَ عَلَى الْفِطْرَةِ / البخاري/ ئەو پیاوە بەرزە کە لە ناو مێرگوزارەکەدا بینیت ئیبراهیم بو، وە ئەو

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن تَقُومَ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ بِأَمْرِهِۦ ۚ ثُمَّ إِذَا دَعَاكُمْ دَعْوَةً مِّنَ ٱلْأَرْضِ إِذَآ أَنتُمْ تَخْرُجُونَ ﴿٢٥﴾ وَلَهُۥ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ كُلٌّ لَّهُۥ قَٰنِتُونَ ﴿٢٦﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى يَبْدَؤُا۟ ٱلْخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَهُوَ أَهْوَنُ عَلَيْهِ ۚ وَلَهُ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ ضَرَبَ لَكُم مَّثَلًا مِّنْ أَنفُسِكُمْ ۖ هَل لَّكُم مِّن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُم مِّن شُرَكَآءَ فِى مَا رَزَقْنَٰكُمْ فَأَنتُمْ فِيهِ سَوَآءٌ تَخَافُونَهُمْ كَخِيفَتِكُمْ أَنفُسَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْءَايَٰتِ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٢٨﴾ بَلِ ٱتَّبَعَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَهْوَآءَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۖ فَمَن يَهْدِى مَنْ أَضَلَّ ٱللَّهُ ۖ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ ۞ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَٱتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَلَا تَكُونُوا۟ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ ٱلَّذِينَ فَرَّقُوا۟ دِينَهُمْ وَكَانُوا۟ شِيَعًا ۖ كُلُّ حِزْبٍۭ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾

منداڵانەی کە بە دەوروبەریدا بون هەمو ئەو منداڵانە بون کە لەسەر فیترەت لە دایك بون. وترا: ئەی پێغەمبەر منداڵانی موشریکەکانیش؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی: {وَأَوْلَادُ الْمُشْرِكِينَ/ بەڵێ، منداڵانی موشریکەکانیش} ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە منداڵی موشریکانیش دەچنە بەهەشتەوەو لێپرسینەوەی لەسەر دایكو باوکی لێ ناکرێت، بەڵام مەبەست بە (فَكُلُّ مَوْلُودٍ) هەمویان نیە واتە: (كُلَّ) لێرەدا عمومو تکرایی ناگەیەنێت بەڵکو زۆرینە دەگەیەنێت، واتە: دەگونجێت هەندێ لە منداڵەکان بەهەشتی نەبن وەك چۆن ﷲ باس لە ئەو بایە دەکات کە بۆ لەناوبردنی گەلی عاد ناردویەتیو دەفەرموێ: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَيْءٍ/ ئەو بایە هەموشتێکی لە ناوبرد﴾

دیارە هەمو ئەوانەی لەناو بردوە کە ﷲ ویستویەتی لەناوبچنو مەبەست بە(كُلَّ) هەموشتێك بەتیکڕا نەبوە، بەڵکو(گشتیەکی تایبەتکراوە/ عموم مخصوص) وە لەلایەکی ترەوە لە بەسەرهاتی خدر لە گەڵ موسادا کە لە سورەتی(الكهف)دا هاتوە کە خدر منداڵێکی کوشتو لە بێباوەڕانی دانا لەکاتێکدا دایكو باوکی باوەردار بون خۆ هەروەها عایشە دەڵێت: پێعەمبەریان بۆ لای جەنازەی منداڵکی ئەنساریەکان بانگ کرد منیش وتم خۆزگەم پێی، چۆلەکەیەکە لە چۆلەکەکانی بەهەشت پێغەمبەرﷺ فەرموی: { أَوْ غَيْرَ ذَلِكَ يَا عَائِشَةَ إِنَّ اللَّهَ خَلَقَ لِلْجَنَّةِ أَهْلًا خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلَاب آبَائِهِمْ، وَخَلَقَ لِلنَّارِ أَهْلًا خَلَقَهُمْ لَهَا وَهُمْ فِي أَصْلَاب

وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوْا۟ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنْهُ رَحْمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴿٣٣﴾ لِيَكْفُرُوا۟ بِمَآ ءَاتَيْنَٰهُمْ ۚ فَتَمَتَّعُوا۟ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾ أَمْ أَنزَلْنَا عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا فَهُوَ يَتَكَلَّمُ بِمَا كَانُوا۟ بِهِۦ يُشْرِكُونَ ﴿٣٥﴾ وَإِذَآ أَذَقْنَا ٱلنَّاسَ رَحْمَةً فَرِحُوا۟ بِهَا ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ إِذَا هُمْ يَقْنَطُونَ ﴿٣٦﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٣٧﴾ فَـَٔاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ يُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن رِّبًا لِّيَرْبُوَا۟ فِىٓ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ فَلَا يَرْبُوا۟ عِندَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ ءَاتَيْتُم مِّن زَكَوٰةٍ تُرِيدُونَ وَجْهَ ٱللَّهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُضْعِفُونَ ﴿٣٩﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُمْ ثُمَّ رَزَقَكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ۖ هَلْ مِن شُرَكَآئِكُم مَّن يَفْعَلُ مِن ذَٰلِكُم مِّن شَىْءٍ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٤٠﴾ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾

آبَائِهِمْ /مسلم/ ئایا هەروا بۆیەدەچیتو جگە لەوە شتێکیتر نازانیت؟ ئەی عایشە اللّٰه خەڵکێکی داناوە بۆ بەهەشتو هەندێکیشی داناوە بۆ ئاگری دۆزەخ لەکاتێکدا ئەوان هەر لە پشتی باوکیاندا بون، واتە: پێش بەدنیا هاتنیان}

جا ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەهەشتی یان دوزەخی منداڵانێك کە هەر بەمنداڵی دەمرن بەپێی باوەڕدار بون یان باوەڕدار نەبونی دایكو باوکیان نیەو دەگونجێت کە منداڵی باوەڕدارانیش بچێتە ناو دۆزەخەوە، ئیستا پرسیار ئەوەیە کە بەهەشتی یان دۆزەخی بونی ئەم منداڵانە لەسەر چیە؟ لەو فەرمودە بەناوبانگەی کە ئیمامی ئەحمەدو بێجگە لەویش دەیگێڕنەوە هاتوە :کە پێغەمبەرﷺ لەباسی ئەهلی فەترت (اهل الفترة) واتە: ئایینی هیچ کام لە پێغەمبەرەکانیان پێ نەگەیشتوەو هەروەها ئەو کەسانەی کە لە دنیادا شێت بونو عەقڵو دەرکی ناسینی چاكو خراپیان نەبوە یان ئەو کەسانەی کە کاتێ ئایینیان پێگەیشتوە ئەوەندە پیر بوون تێگەیشتنی هیچیان نەبوە کە اللّٰه لە قیامەتدا تاقیان دەکاتەوە، جا هەر کام لەو تاقی کردنەوەیە سەرکەوتن دەچنە ناو بەهەشتەوەو ئەوانەی تر کە فەرمانی (اللّٰه) یان جێبەجێ نەکرد دەچنە ناو دۆزەخەوە. وە (الله اعلم) دەگونجێت منداڵانێکیش کە بە منداڵی مردون هەروەك ئەمانە لە قیامەتدا تاقی بکرێنەوە، جا هەر اللّٰه دەزانێت کە کێ رزگاری دەبێتو کێ توشی ئاگری دۆزەخ دەبێت، جا ئابەم شێوەیە سوپاس بۆاللّٰه دەتوانرێت هەمو فەرمودەکانو ئایەتەکان لەگەڵ یەکدا یەك بخرێن، ئەمە بۆچونی ئەوانەیە کە بەهەشتی یان دۆزەخی بونی منداڵان هەرلە عیلمی خوای دە زاننو بڕیاری لە سەر نادەن، بەڵام زۆربەی ئەهلی سونەت منداڵی باوەڕدارانو هەروەها بێباوەڕانیش کە پێش لە باڵقبون دەمرن بە بەهەشتیان دەزانن.

(٣١) گەڕانەوەتان هەر بۆ لای ئەو زاتە دەبێتو لێی بترسنو نوێژ بکەنو لە لەموشریکان مەبن.

(٣٢) لەو کەسانەی کە ئایینەکەی خۆیان بەش بەشکردو بون بە دەستە دەستەی جیاجیا، هەمو دەستەو پێرێکیش هەر بەوەی کە لای خۆیەتی کەیفخۆشە. اللّٰه داوا لە باوەڕداران دەکات کە بە ناکۆکیو بەش بەشی لە ئایین، خویان نەکەن موشریك، چونکە ئەوە وا دەکات کە هەر کەس بەس حزبو دەستەی خۆی بەحەق بزانێتو ئەوەی کەلەلای حزبەکەی حقو راست بێت هەر ئەوە بەحەق دەزانێت، وە ئەوەی کە حزبەکەی بە خراپی بزانێت بە خراپی دەزانێت، ئیتر ئەوە رەوا بێت یان ناڕەوا، جا ئەمەش مانای هاوەڵدانانە بۆ اللّٰه، خوا دەفەرموێ: موسڵمان برای یەکترن تۆدەڵێیت: لە ئێمە نیە، چونکە سەربە حیزبەکەت نیە دەی پێم بڵێ لێرە بەگوێی خوات کرد یان بە گوێی حیزبەکەت؟ دەی تاکەی کوێرانە هەنگاو هەڵدەگریت؟ خۆ هەرکاتێ‌مردیت تازە ناگەڕێیتەوە، موسڵمان هەموی یەك حیزبەو خاوەنی یەك بەرنامەیە کەقورئانەودەبێ یەکدەستبن دژ بەدین دوژمنان ئەگەر لەو رێگایە لاتدا لە ئیسلامەتی دەردەچیت جا ناوی خۆت چی دەنێی بنێ خوا دەتناسێ.

(٣٣) هەر کاتێك تەنگو چەڵەمەیەك هات بە سەر ئەم خەڵکەدا ئەو کاتە بە گەردنکەچیو لە ناخی دڵەوە هاوار دەکەنە پەروەردگاری خۆیان چونکە دەزانن لەو کاتەدا ئەو بتانە هیچیان پێناکرێت، پاشان هەر کاتێك سۆزو نیعمەتی اللّٰهیان بۆ هاتو لەو تەنگانە رزگاریان بو کتوپڕ هەندێکیان هاوبەش دادەنێن بۆ پەروەردگاریان.

(٣٤) ئێمە ئەو نیعمەتانەمان پێدان کە ئاوا ئێوە بێباوەڕو ناسوپاس بن؟! سا ڕابوێرن بەم زووانە دەزانن سەر ئەنجامی کردارو ڕەفتارە ناپەسەندەکانتان بە کوێ دەگات.

(٣٥) ئایا ئێمە هیچ بەڵگەیەکمان بەوان داوە کە لەبارەی ئەو شتانەی کە ئەوان دەیکەن بە هاوبەشمان قسە بکات، واتە نەخێر، بەڵکو ئەوان ناحەقو درۆزنن.

(٣٦) جا هەر کاتێك ئێمە نیعمەتەکانی خۆمان لە سەروەتو سامانو بارانو تەندروستی بەم خەڵکە ببەخشین شادمانو کەیفخۆشنو بەو نیعمەتانەی کە پێمان بەخشیون لەخۆبایی

دەبن ، ئەوسا ئەگەر دوچاری بەڵایەك ببن بەهۆی خراپی خۆیانەوە كتوپڕ نائومێد دەبن واتە: كەم كەسانێك هەن كە پەروەردگاری خۆیان بە چاكی بناسنو بزانن كە ژیان بە خۆشییو ناخۆشیەوە دوایی دێتوچ خۆشییو ناخۆشی هەردوو بۆ تاقی كردنەوەی مرۆڤەو دەبێ لە كاتی خۆشیو ناخۆشی ژیاندا ئاگای لە خۆی بێت، نە بە خۆشی لەخۆبای ببێتو لە سنور دەرچێت، وەنە بە ناخۆشیش بپسێتو زمان درێژی بكات بەرامبەر بە پەروەردگاری، جا بزانێت كە هەموی بەویستی ﷲیە هەروەكو دەفەرموێ:

(٣٧) ئایا نازانن كە ﷲ رۆزی خۆی بە لێشاوی دەدات بە كەسێك ئارەزۆی لێ بێتو دەیگرێتەوە لە كەسێك كە ئارەزۆی لێ بێت، بەڕاستی لەمەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك كە باوەڕ دەكەن.

(٣٨) جا ڕوو لەو نیعمەت پێدراوانە دەكاتو دەفەرموێ: سا بەوەی كە خزمە مافی خۆی بدە، هەروەها بەبێ نەوایانو بە رێبواران، هەر ئەوە چاكە بۆئەو كەسانەی كە مەبەستیان ڕەزامەندی ﷲیە خۆ هەر ئەوانیشن ڕزگار لە سزاو تۆڵەی پاشەڕۆژ، نەكەن مەبەستتان هەر كۆكردنەوەی سەروەتو سامان بێت بە نەدانی ماف بە خاوەن مافانو پارە بە سوو دان،

(٣٩) ئەوەی كە بە سوو دەیدەن بە خەڵك بۆ ئەوەی سەروەتو سامانتانی پێ زیاد بكەن ئەوە لەلای ﷲ زیاد ناكاتو ئەوەی كە بە زەكات دەیدەنو مەبەستان ڕەزامەندی ﷲیە بەڕاستی ئا ئەوانەن كە ماڵو سامانی خۆیان زیاد دەكەن، چونكە هەم لە دنیادا ﷲ رۆزیان بۆ زیاد دەكاتو هەم لە ڕۆژی قیامەتیشدا پاداشتی چەند بەرانبەریان پێدەداتەوە كەواتە: ئەوانە بە ماڵ بەخشینو زەكات دان سەروەتو سامانی خۆیان فرەوانتر كرد هەر وەك لەفەرمودەدا هاتوە كە:{مَا نَقَصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مَالٍ/مسلم/ ماڵ بەخشین هیچ لە ماڵ كەم ناكاتەوە} .

(٤٠) ﷲ ئەو زاتەیە كە ئێوەی دروستكردوە پاشان ڕزقورۆزی پێدان پاشان دەتان مرێنێت دیسان زیندوتان دەكاتەوە، دەی ئایا هیچ كام لە شەریكەكانتان هیچ شتێك لەوانەتان بۆ دەكات، ئەو زاتە بێ عەیبو پاكو بەرزترە لەوەی كە ئێوە دەیانكەن بە هاوبەشی.

(٤١) بەڵاو تەنگانەو وێرانی لە وشكاییو لە دەریادا دەركەوت بە هۆی ئەو ئیشە خراپانەی كە بە دەستی ئەم خەڵكە ئەنجامدراوە تا سزای هەندێك لەوانەی كەكردویانە بچەژن بەڵكو بیر بكەنەوەو لەو تاوانانە بگەڕێنەوە. خراپەو تاوانی مرۆڤ دەبێت بەهۆی بەڵاو تەنگانەو وەشكە ساڵیو نخوشی جۆراو جۆرو

قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلُ ۚ كَانَ أَكْثَرُهُم مُّشْرِكِينَ (٤٢) فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ ٱلْقَيِّمِ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِىَ يَوْمٌ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ ۖ يَوْمَئِذٍ يَصَّدَّعُونَ (٤٣) مَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِأَنفُسِهِمْ يَمْهَدُونَ (٤٤) لِيَجْزِىَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ (٤٥) وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَن يُرْسِلَ ٱلرِّيَاحَ مُبَشِّرَٰتٍ وَلِيُذِيقَكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَلِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ (٤٦) وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ رُسُلًا إِلَىٰ قَوْمِهِمْ فَجَآءُوهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَٱنتَقَمْنَا مِنَ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ ۖ وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ (٤٧) ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرْسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبْسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيْفَ يَشَآءُ وَيَجْعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلْوَدْقَ يَخْرُجُ مِنْ خِلَٰلِهِۦ ۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ (٤٨) وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيْهِم مِّن قَبْلِهِۦ لَمُبْلِسِينَ (٤٩) فَٱنظُرْ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحْمَتِ ٱللَّهِ كَيْفَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ (٥٠)

دەیانو سەدان كارەساتی تر. وە بە پێچەوانەیشەوە بەرێوەبردنی ئایینو دادپەروەریو ڕەوشت بەرزی دەبێت بەهۆی خێرو بەرەكەتی زەویو دابەزینی سۆزو نیعمەتی ﷲ بۆ خەڵك. لە فەرمودەدا هاتوە كە پاش كوشتنی دەجالو یەئجوجو مەئجوجو بەرێوەبردنی یاسای ﷲو چەسپاندنی فەرمانەكانی، بە زەوی دەوترێت {أَخرِجي بَرَكَاتِك. فَيَأكُلُ مِنَ الرُّمَّانَةِ الفِئامُ مِنَ النَّاس، وَيَستَظِلُّونَ بِقِحفِها، وَيَكفِي لَبَنُ اللُّقحَةِ الجَماعَةَ مِنَ النَّاس/رواه الترمذي. صححه الالباني / بە زەوی دەوترێت فەرو بەرەكەتەكانی خۆت دەردە، جا ئەو كاتە یەك هەنار ئەوندە گەورە دەبێت كە لە یەك هەنار تێرەیە لەخەڵك دەخواتو بە توێكڵەكەی سێبەر دەكەن بۆ خۆیان، وە ئاژەڵەكان ئەوندە بەشیر دەبن كە شیری یەك حەیوان بۆ كۆمەڵێك خەڵك بەسە} .

وە هەروەها لە فەرمودەیەكدا هاتوە كە:{أنَّ الفَاجِرَ إذَا مَاتَ تَستَرِيحُ العِبَادُ وَالبِلادُ، وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابّ/النسائي، صححه الالباني / بەبێگومان هەر كاتێك خراپەكار دەمرێت بەندەكانو شارەكانو درەختەكانو ئاژەڵانیش پشوویەك دەدەنو هەناسەیەكی ئاسودەیی دەكێشن} ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٤٢) بڵێ: با بەناو زەویدا بگەڕێن، جا تەماشا بكەن بزانن ئەوانەی پێش ئەوان چییان بەسەرهات كە زۆربەیان هاوبەشیان بۆ ﷲ دادەنا؟

وَلَئِنْ أَرْسَلْنَا رِيحًا فَرَأَوْهُ مُصْفَرًّا لَّظَلُّوا۟ مِنۢ بَعْدِهِۦ يَكْفُرُونَ ﴿٥١﴾ فَإِنَّكَ لَا تُسْمِعُ ٱلْمَوْتَىٰ وَلَا تُسْمِعُ ٱلصُّمَّ ٱلدُّعَآءَ إِذَا وَلَّوْا۟ مُدْبِرِينَ ﴿٥٢﴾ وَمَآ أَنتَ بِهَـٰدِ ٱلْعُمْىِ عَن ضَلَـٰلَتِهِمْ ۖ إِن تُسْمِعُ إِلَّا مَن يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا فَهُم مُّسْلِمُونَ ﴿٥٣﴾ ۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ ضَعْفٍ قُوَّةً ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِيمُ ٱلْقَدِيرُ ﴿٥٤﴾ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يُقْسِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ مَا لَبِثُوا۟ غَيْرَ سَاعَةٍ ۚ كَذَٰلِكَ كَانُوا۟ يُؤْفَكُونَ ﴿٥٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ وَٱلْإِيمَـٰنَ لَقَدْ لَبِثْتُمْ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْبَعْثِ ۖ فَهَـٰذَا يَوْمُ ٱلْبَعْثِ وَلَـٰكِنَّكُمْ كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٥٦﴾ فَيَوْمَئِذٍ لَّا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ مَعْذِرَتُهُمْ وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٥٧﴾ وَلَقَدْ ضَرَبْنَا لِلنَّاسِ فِى هَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ۚ وَلَئِن جِئْتَهُم بِـَٔايَةٍ لَّيَقُولَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُبْطِلُونَ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٥٩﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۖ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ ٱلَّذِينَ لَا يُوقِنُونَ ﴿٦٠﴾

﴿٤٣﴾ جا بەڕێكو ڕاستی ڕوو بكەرە ئەم ئایینە بەنرخە پێش ئەوەی كە ڕۆژێك بێت كە هیچ بەرپەرچ دەرەوەیەك بۆ ئەو ڕۆژە لە لایان اللهوە نیە، كە لەو ڕۆژەدا بەش بەش دەبن.

﴿٤٤﴾ جا هەر كەسێك كافر بێت ئەوە زیانی بێباوەڕییەكەی تەنها لەسەر خۆیەتی، وە هەر كەسێكیش كاری چاكی كردبێ، ئەوسا ئەوانە جێگای حەسانەوەی چاكیان بۆ خۆیان ئامادەكردوە.

﴿٤٥﴾ تا الله لە كەرەمو چاكەی خۆی پاداشتی ئەو كەسانە بداتەوە كە باوەڕیان هێناوەو ئیشی چاكیان كردوە، بەڕاستی ئەو بێباوەڕانی خۆش ناوێ، جا هەر كەسێ خوا خۆشی نەوێت دە بێ ئەو ژیانەیان چۆن بێت؟

﴿٤٦﴾ جا هەندێك لە نیشانەی سۆزو نیعمەتی ئەو زاتە ئەوەیە كە بای موژدەدەر بە باران ڕەوانە دەكات تا لەسۆزو میهرەبانی خۆیتان پێ تام بكات، وە تا بەهۆی ئەو بایە كەشتیەكان بە فەرمانی الله بەناو دەریادا هاتوچۆ بكەن، جا تا ئێوەیش فەڕو خێری ئەو بە دەست بهێنن‌و بەو ئومێدە كە ئێوە سوپاسی بكەن‌و سپڵەو نمەك نەناس نەبن.

﴿٤٧﴾ جا بەڕاستی پێش تۆ پێغەمبەرانێكی زۆرمان بۆ لای گەلەكانیان ڕوانە كردوە، جا ئەوانیش بە بەڵگە گەلێكی ڕوونەوە چوونەتە لایان‌و پەیامی خوایان پێگەیاندون بەڵام گەلەكەیان باوەڕیان پێ نەهێناون، جگە لە ژمارەیەكی كەم ئینجا لەو كەسانەی كە تاوانیان كردبو تۆڵەمان سەند، وە ئەوانەیش كە باوەڕیان هێنا بو ڕزگارمان كردن، چونكە یارمەتیدانی باوەڕدارانمان لەسەر خۆمان پێویست كردوە.

﴿٤٨﴾ الله ئەو زاتەیە كە با ڕەوانە دەكات، جا ئەویش هەور جموجۆڵ پێدەكات ئەوسا لە ئاسماندا چۆنی ئارەزۆی لێ بێت ئەو هەورە پان‌و بڵاو دەكاتەوەو پارچە پارچەیشیان دەكات، ئەوسا دەبینی لەنێوان ئەو هەورەدا دڵۆپ دڵۆپ باران دێتە دەرەوە، جا هەر كاتێك ئەو بارانە بدات لە هەر كەسێك لە بەندەكانی خۆی كە ویستی لە سەر بێ كتوپڕ ئەوان موژدەی خۆشی بە یەكتر دەدەن‌و شادمان دەبن.

﴿٤٩﴾ ئەگەر چی ئەوان پێش ئەوەی كە ئەو بارانەیان بۆ بباریێت پێش ئەوە زۆر نائومێد ببون.

﴿٥٠﴾ دەی تەماشای شوێنەواری سۆزی الله بكەو بزانە چۆن ئەو زەویەی پاش وشكی‌و بێ گژوگیای‌و مردویی زیندوی كردوە كە ئەمە هەمیشە لەبەر چاوتاندایەو دەیبینن بێگومان ئەو زاتەی كە ئەوانە دەكات مردویش زیندو دەكاتەوە. خۆ ئەو بەسەر هەمو شتێكدا زۆر بەتوانایە.

﴿٥١﴾ جا بەدڵنیاییەوە ئەگەر ئێمە بایەك بنێرین كە زۆر سارد یان زۆر گەرم بێت كە ئەو دەغڵەیان زەرد هەڵبگەڕێنێت‌و بیگەنێنێت‌و وشكی بكات، بەڕاستی بە دوای ئەودا دەست بە گلەیی‌و زمان درێژی‌و ناسزای دەكەن. وەك ئەوەی كە هیچ چاكەیەكیان لە گەڵدا نەكرابێت، بەڕاستی ئەم جۆرە كەسانە مردون‌و زیندوكردنەوەیان ئەستەمە. بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٥٢﴾ بەڕاستی تۆ ناتوانیت بەم مردووانە ببستێنی‌و ناتوانی ئەم بانگە بە كەڕ بگەیەنیت، هەر كاتێك كە ئەوان گوێت پێنەدەن‌و پشتت تێبكەن.

﴿٥٣﴾ جا تۆ ناتوانیت ڕێ نمونیكەری كوێر بیت بۆ ڕزگاری كردنیان لە گومڕایی، تۆ تەنها بەو كەسانە دەتوانی ببیستێنی كە باوەڕ بە نیشانەكانی ئێمە دەكەن ئەوسا خۆ هەر ئەوانن گەردنكەچی فەرمانەكانمان دەبن.

﴿٥٤﴾ الله ئەو زاتەیە كە ئێوەی لە سەرەتادا لە لاوازییەوە دروستكردوە پاشان ئەو لاوازیەی گۆڕی بە هێزو تواناو كردنی بە مرۆڤی تەواو پاشانیش دوای بەهێز بونتان لاوازی كردنەوە بە هۆی پیریەوە، جا ئەو زاتە هەرچی ئارەزۆ بكات دروستی دەكات

خۆ هەر ئەو خۆیەتی زاناو بە توانایە بۆ ئەنجامدان وهێنانە دی هەمو ویستەکانی.

(٥٥) جا ئەو ڕۆژەی کەقیامەت هات تاوانباران سوێند دەخۆن کە لە دنیادا ساتێکی کەم ماونەتەوە، دەیانەوێت بەم سوێندە خۆیان ڕزگار بکەن کە گوایە ئەوەندە لە دنیادا نەژیاوین تا لە ئایین تێبگەین، کەواتە: بێ تاوانین جا وەك لێرەدا ئاوا درۆ دەکەن لەدنیایشدا هەر ئاوەها بە درۆو دەلەسە لە ڕێگای ڕاست لادران.

(٥٦) خۆ ئەو کەسانەی کە زانستو ئیمانیان پێدراوە دەڵێن: بەڕاستی ئێوە بەو ئەندازەی کە لەلایەن اللەوە بۆتان دانراوە لە دنیادا ماونەوە کە دەتانتوانی بۆ بەختەوەری ئەم ڕۆژە کەڵکتان لێ وەربگرتایە، بەڵام ئەوەتان نەکرد تا گەیشتن بەم ڕۆژی زیندوبونەوە، جا ئەمە ڕۆژی زیندوبوونەوەیە بەڵام ئێوە نەتان دەزانی. واتە ئەگەر دەتوانن با زیندو نەبنەوە تا حیسابتان لەگەڵدا نەکەین.

(٥٧) ئەوسا ئەمڕۆ ئەوانەی کە ستەمیان کردوە، بەهانەکانیان هیچ سوودیان پێناگەیەنێت، خۆ داوای گەڕانەوەو پەشیمان بونەوەیشیان لێناکرێت و ڕێگایشیان پێ نادرێت بۆ گەڕانەوە بۆ دنیا.

(٥٨) جا بەڕاستی لەم قورئانەدا بۆ خەڵك وێنەی جۆراو جۆرمان هێنایەوە، بەڵام ئەوان هیچ سوودێکیان لێ وەرنەگرت. وە بەڕاستی هەر بەڵگەیەکیان بۆ بهێنی، ئەو خوانەناسانە بە ئێوە دەڵێن: ئێوە هەر ساختەچینو جگە لە قسەی پڕو پوچ شتێکی ترتان لا نیە.

(٥٩) هەر ئاوەها اللە دڵی ئەو کەسانەی کە نایانەوێت ڕاستی بزانن مۆر دەکات، جا ئیتر چاكو خراپ لەیەك جیا ناکەنەوە.

(٦٠) جا ئارامت بێو دان بە خۆتا بگرە چونکە زۆر نابات کە ئەوان لەناو دەچن بێگومان ئەوە بەڵێنی اللەیە، جا با ئەوانەی کە یەقینیان بە ڕۆژی قیامەت نیە لە ڕێگای ڕاست لات نەدەنو سوکت نەکەن.

## ٣١ سورەتی لوقمان ٣٤

سورەتی لوقمان کە سورەتی سی‌ویەکەمی قورئانە، سی‌و چوار ئایەتە، لە مەکە دا هاتوەتە خوارەوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاوحەوتەمەو پاش سورەتی (الصافات)و پێش (سبأ) دابەزیوە. وشەی (لقمان) دوو جار لە قورئاندا هاتوە ئەویش تەنها لەم سورەتەدایە کە ناوی یەکێك لە پیاوچاکان بوە کە بەزانایی‌و دانایی وەسف کراوەو هەندێکیش پێیان وایە یەکێکە لە پێغەمبەران.

سُورَةُ لُقْمَانَ ٣١ ٣٤

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ هُدًى وَرَحْمَةً لِّلْمُحْسِنِينَ ﴿٣﴾ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا وَلَّىٰ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا كَأَنَّ فِىٓ أُذُنَيْهِ وَقْرًا ۖ فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقًّا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٩﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ بِغَيْرِ عَمَدٍ تَرَوْنَهَا ۖ وَأَلْقَىٰ فِى ٱلْأَرْضِ رَوَٰسِىَ أَن تَمِيدَ بِكُمْ وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ ۚ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوْجٍ كَرِيمٍ ﴿١٠﴾ هَٰذَا خَلْقُ ٱللَّهِ فَأَرُونِى مَاذَا خَلَقَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ بَلِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١١﴾

بەناوی اللە ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف، لام، میم.

(٢) ئەمانە ئایەت گەلێکن لەم پەڕاوە پڕ لە ژیریو داناییەدا.

(٣) کە ڕێنمونیکەرو خەیر وخۆشبەختی دنیاو دوارۆژە بۆ چاکەکاران.

(٤) ئەو کەسانەی کە نوێژ دەکەنو زەکات دەدەن لەحاڵێکدا کە هەر ئەوانەن کە یەقینیان بە ڕۆژی قیامەت هەیە.

(٥) ئەوانن کە لەسەر ڕێنماییین لەلایەن پەروەردگاری خۆیانەوەو هەر ئەوانیشن ڕزگاربووان.

(٦) لەحاڵێکدا هەندێك لە خەڵك قسەی پڕوپوچ دەکڕن تا بەوە خەڵك لە ڕێگای اللە لا بدەن بە بێ ئەوەی بزانێ کەبەوبازرگانیەی چ زیانێکی لەخۆیو لەخەڵك داوە تا بەم شێوەیە گاڵتە بە ڕێگای اللە بکات، بۆها ئەوانە هەیە سزای زەبونکەرو گاڵتەپێکەر، چونکە ئەوانە گاڵتە بە ئاینی ئیسلامو قورئان دەکەن.

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ أَنِ ٱشْكُرْ لِلَّهِ ۚ وَمَن يَشْكُرْ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ حَمِيدٌ ﴿١٢﴾ وَإِذْ قَالَ لُقْمَٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ يَٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا ۖ وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا ۖ وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ۚ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ يَٰبُنَىَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ فَتَكُن فِى صَخْرَةٍ أَوْ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوْ فِى ٱلْأَرْضِ يَأْتِ بِهَا ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٌ ﴿١٦﴾ يَٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾ وَٱقْصِدْ فِى مَشْيِكَ وَٱغْضُضْ مِن صَوْتِكَ ۚ إِنَّ أَنكَرَ ٱلْأَصْوَٰتِ لَصَوْتُ ٱلْحَمِيرِ ﴿١٩﴾

ئیبنو مەسعود سەبارت بە ﴿لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ﴾ دەڵێت:{ الغِناءُ واللهِ الذّي لا إلَهَ إلا هُو، يُرَدِّدُها ثَلاثَ مَرَاتٍ/ابن أبي شيبة، والحاكم، البيهقي وقال الحاكم : " صحيح الإسناد " ووافقه الذهبي وقال الالباني: هو كما قالا وصححه ابن القيم / سوێند بەو زاتەی کە هیچ پەرستراوێکی بەحەق جگە لەو نییە ئەوە گۆرانیە، وە سێ جاریش ئەمەی دووبارە کردەوە.}

وە ئیبنو عباس وجابر وعیکرمەو سەعیدی کوڕی جوبەیرو مجاهیدو مەکحول وعەمری کوڕی شوعەیبو حەسەنی بەصری خوا لێیان رازی بێت هەروا دەڵێن. خۆ پێغەمبەری خواش ﷺ پێمان رادەگەیەنێت کە لە ئاخر زەماندا گەلانێك بەکارهێنانی ئامێرەکانی مۆسیقا بە حەلاڵ دەزانن و دەفەرموێ:{ لَيَكُونَنَّ مِنْ أُمَّتِي أَقْوَامٌ يَسْتَحِلُّونَ الحِرَ وَالحَرِيرَ وَالخَمْرَ وَالْمَعَازِفَ./ البخاري/ لە ئومەتی من گەلانێك دەبن کە زیناو هەورێشمو شەرابو گۆرانیو ئامێرەکانی مۆسیقا حەلاڵ دەکەن}راستت فەرموە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ وا ئەمڕۆ ئێمە بەچاوو گوێی خۆمان دەیبینین و دەیبیسین.

لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: { لَا تَبِيعُوا الْقَيْنَاتِ وَلَا تَشْتَرُوهُنَّ وَلَا تُعَلِّمُوهُنَّ وَلَا خَيْرَ فِي تِجَارَةٍ فِيهِنَّ وَثَمَنُهُنَّ حَرَامٌ فِي مِثْلِ هَذَا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الْآيَةُ وَمِنْ النَّاسِ مَنْ يَشْتَرِي لَهْوَ الْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ إِلَى آخِرِ الْآيَةِ /الترمذي. حسنه الالباني/ ئافرەتە گۆرانی بێژەکان نەبفرۆشن و نەبکڕن و نەفێری گۆرانیان بکەن، جا بازرگانی بەوانە هیچ سودێکی تێدا نیەو پارەکەیان حەرامە، لەبارەی شتی وەك ئەوەوە ئەم ئایەتە دابەزیوە﴿لەحاڵێکدا هەندێك لە خەڵك قسەی پڕوپوچ دەکڕن تا بەوە خەڵك لە ڕێگای ﷲ لا بدەن... تاکۆتایی ئایەتەکە﴾ } جا ئەمەش تەفسیری پێغەمبەر ﷺ بو بۆ ئەم ئایەتە، وردبەرەوە گوڵەبەرۆژەکان نەتخەڵەتێنن .

﴿٧﴾ جا هەر کاتێك ئایەتو نیشانەکانی ئێمەی بە سەردا بخوێنرێتەوە بە لوت بەرزی و فیزەوە پشتی تێدەکات، وەکو ئەوەی کە نەیبیستبێت، جا هەر وەك ئەوەی کە لەناو گوێی دا بارێکی گران هەبێت، سا تۆ موژدەی بدەرێ بە سزایەکی پڕ ئێشو ژان، چونکە لە دنیادا بە بیستنی قورئان گوێی ژانی دەکردو پشتی تێدەکردو سەر گەرمبو بە گاڵتەو گەمەو گوێدان بەقسەی پڕوپوچەوە جا ئەمڕۆش بەوشێوەیە سزا دەدرێت.

﴿٨﴾ بێگومان ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردووە، بۆ ئەوانە باخچە گەلی پڕ خێرو بێر هەیە

﴿٩﴾ کە هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، بەڵێنی ﷲیەو ڕاستەو دێتە دیو هەر خۆیەتی زۆر بە تواناو کاربەجێیە.

﴿١٠﴾ ﷲ ئاسمانانی بە بێ کۆڵەکەیەك کە بیبینن دروستکردووەو چیاکانی تێدا داناوە تا بە هۆی ئەوانەوە زەوی جموجوڵتان پێ نەکات، خۆ هەمو جانەوەرێکیشی تێدا بڵاوکردوەتەوە، جا لە ئاسمانەوە ئاومان ناردووەتە خوارەوە، ئەوسا لەهەمو جوتێکی زەریفمان تێیدا ڕواندوە. ئەمانە هەموی بۆئێمەی مرۆڤە تابیناسین و بەندایەتی بکەین، بەداخەوە زۆربەی مرۆڤ سپڵەو نمەك نەناسە.

﴿١١﴾ ئەمە دروستکراوی ﷲیە، جا ئادەی پیشانم بدەن بزانم پەرستراوانی جگە لەو چییان دروستکردوە؟ بەڵکو ستەمکاران لە گومراییەکی ئاشکرادان. ئینجا خواباسی لوقمان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٢﴾ بەڕاستی دانایمان بەخشی بە لوقمان کە وتمان: سوپاسی ﷲ بکەو هەر کەس سوپاسی بکات سوودی بۆ خۆیەتیو هەر کەسێکیش سپڵە بێت ئەویش هەر زیانی لە خۆی داوە چونکە بەڕاستی ﷲ بێنیازو سوپاسکراوە چی تۆ سوپاسی بکەیت یان نەیکەیت.

﴿١٣﴾ باس بکە بۆیان ئەو کاتەی کە لوقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی کردو پێی وت: ئەی کوڕە بچکۆلەکەم هاوەڵ دانەنێیت بۆ ﷲ بەڕاستی هاوەڵ دانان ستەمێکی گەورەیە.

(١٤) ئەوسا ئامۆژگاری مرۆڤمان کردوە کە لەگەڵ باوکو دایکیدا چاك بێو دڵیان نەشکێنێت بەتایبەت دایك کە ئەوی هەڵگرتوەلە سکیدا، جا بەو حەملەوە لاوازیو سەختی یەك بەدوای یەکی بەسەردا هاتوە. وە بڕانەوەیشی لە شیر لە دوای دوو ساڵدا، جا پێمان وت: سوپاسی من بکەو سوپاسی باوکو دایکیشت، سەرئەنجام هەر دێنەوە بۆلای من. وەك لێرەو لە چەند ئایەتێکی تری قورئان دا هاتوە پاش فەرمان بە سوپاسی پەروەردگار، فەرمان دەدات کە سوپاسی دایكو باوك بکرێت. دەی ئەمە ماف پێدانە یان لەساڵێکدا رۆژێکی هەبێ؟

(١٥) جا ئەگەر هەوڵیاندا لەسەر ئەوەی کە تۆ بیکەیت بە هاوبەشی من ئەوەی کە هیچ زانیاریەکت لەبارەویەوە نیە بە گوێیان مەکەو لە ژیانی دنیادا بە چاکی لەگەڵیاندا رەفتار بکە، جا لەسەررێگەی ئەو کەسە بە کە بۆ لای من دەگەڕێتەوە، پاشان گەڕانەوەتان بۆ لای منەو ئەوسا پێتان دەڵێم ئەوەی کە کردوتانە، تۆ لەسەر چاکەی خۆتو ئەوانیش لەسەر خراپەی خۆیان هەر یەکەتان مافی خۆی وەردەگرێت، چاك بەچاكو خراپ بەخراپ.

(١٦) ئەی کوڕە بچکۆلەکەم ئەگەر ئەو کردارە خراپە بە ئەندازەی تۆوی خەرتەلەیەك بێت، جا لەناو بەردێکدا شاردرابێتەوە یان لەناو ئاسمانەکان یان لەناو ئەم زەویەدا بێت ﷲ دەیهێنێتە ڕوو، بێگومان کە ﷲ وردبینو زۆر بە ئاگایە.

(١٧) ئەی کوڕە بچکۆلەکەم نوێژ بکەو فەرمان بە چاکەو بەرگری لە خراپە بکەو خۆبگرە لەسەر ئەوەی کە دوچارت دەبێت بە هۆی ئەنجامدانی ئەم ئەرکە پیرۆزتەوە بێگومان ئەوخۆگریە لەکارە پێویستو گرنگەکانە.

(١٨) جا بە فیزەوە ڕووت لە خەڵك وەرمەگێڕەو بە لوت بەرزیەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ بێگومان کە ﷲ ئەوانەی خۆش ناوێت کە بە ڕێ دا بە لارەو لەنجەوە دەڕۆنو لەخۆ ڕازین.

(١٩) لە ڕۆیشتندا میانڕەوبەو لە قسە کردنیشدا هێواش بە و دەنگت لە ئەندازەی پێویست بەرز مەکەرەوە، چونکە ناشیرینترین دەنگ دەنگی گوێدرێژە. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{إذا سَمِعتُم صِيَاحَ الدِّيكَةِ فَاسأَلُوا اللهَ مِن فَضلِهِ، وَإذا سَمِعتُم نَهِيقَ الحَميرِ فَتَعَوَّذوا بِاللهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ فَإنَّها رَأَت شَيطَاناً/متفق عليه/ هەر کاتێك گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بو داوای خێرو بەرەکەت لە ﷲ بکەن، وە هەر کاتێکیش گوێتان لە دەنگی گوێدرێژ بو پەنا بگرن بە ﷲ لە شەڕی شەیتانو بڵێن: اعوذ بِاللهِ مِنَ الشَّيطَانِ الرَّجِيمِ چونکە ئەو شەیتانی بینیوە بۆیە سەڕاندوێتی).

أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ ٱللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُۥ ظَٰهِرَةً وَبَاطِنَةً ۗ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يُجَٰدِلُ فِى ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَٰبٍ مُّنِيرٍ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُوا۟ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ يَدْعُوهُمْ إِلَىٰ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٢١﴾ ۞ وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ٱلْوُثْقَىٰ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٢٢﴾ وَمَن كَفَرَ فَلَا يَحْزُنكَ كُفْرُهُۥٓ ۚ إِلَيْنَا مَرْجِعُهُمْ فَنُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ نُمَتِّعُهُمْ قَلِيلًا ثُمَّ نَضْطَرُّهُمْ إِلَىٰ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٢٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ۚ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٥﴾ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٢٦﴾ وَلَوْ أَنَّمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن شَجَرَةٍ أَقْلَٰمٌ وَٱلْبَحْرُ يَمُدُّهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَٰتُ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٢٧﴾ مَّا خَلْقُكُمْ وَلَا بَعْثُكُمْ إِلَّا كَنَفْسٍ وَٰحِدَةٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌۢ بَصِيرٌ ﴿٢٨﴾

(٢٠) ئایا نەتان بینیوە کە ﷲ ئەوەی کە لەناو ئاسمانەکاندایەو ئەوەش کەلەناو زەویدایە هەموی رامو گەردنکەچ کردوە بۆتانو خێرو بەرەکەتی ئاشکراو نهێنی خۆی بە لێشاو پێداون، کەچی هێشتا هەندێك لە خەڵك هەن کە لە بارەی زاتی ﷲوە بەبێ زانیاریو بەبێ ڕێنمایی، وە بە بێ ئەوەش کەپەڕاوێکی ڕۆشنکەرەوەی بە دەستەوە بێت دەمەدەمە دەکاتو دژایەتی ئایین دەکات.

(٢١) خۆ هەر کاتێکیش بەوان بوترێت: پەیڕەوی ئەوە بکەن کە ﷲ ناردویەتی، دەڵێن نەخێر، ئێمە هەر پەیڕەوی لەوە دەکەین کە باوباپیرانمان لەسەری بون، ئایا هەر ئاوەها گێلو گەمژە دەبن با شەیتانیش بانگیان بکات بۆ سزای ئاگر؟!

(٢٢) ئەوسا هەر کەسێك بە تەواوی ڕوو بکاتە ﷲ لەحاڵێکدا ئەو چاکەکار بێت بەڕاستی ئەوە دەستی گرتوە بە دەستەیەکی زۆر بتەووموحکەمەوەو سەرئەنجامی هەمو کاروبارێکیش هەر بۆ لای ﷲ یە.

(٢٣) جا هەر کەسێکیش بێباوەڕو خوانەناس بو با ئەو کوفرو خوانەناسی ئەوە خەمبارت نەکات، گەڕانەوەیان هەر بۆ لای ئێمەیە، ئەوسا هەواڵیان پێدەدەین بەوەی کە کردویانە، بەڕاستی ﷲ زۆر زانەرە بەوەی کە لەناو دڵەکاندایەو هیچی لێ ون نابێت.

أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى وَأَنَّ ٱللَّهَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلۡبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٠﴾ أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱلۡفُلۡكَ تَجۡرِي فِي ٱلۡبَحۡرِ بِنِعۡمَتِ ٱللَّهِ لِيُرِيَكُم مِّنۡ ءَايَٰتِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّكُلِّ صَبَّارٖ شَكُورٖ ﴿٣١﴾ وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ فَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞۚ وَمَا يَجۡحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا كُلُّ خَتَّارٖ كَفُورٖ ﴿٣٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡ وَٱخۡشَوۡاْ يَوۡمٗا لَّا يَجۡزِي وَالِدٌ عَن وَلَدِهِۦ وَلَا مَوۡلُودٌ هُوَ جَازٍ عَن وَالِدِهِۦ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلسَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡأَرۡحَامِۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسٞ مَّاذَا تَكۡسِبُ غَدٗاۖ وَمَا تَدۡرِي نَفۡسُۢ بِأَيِّ أَرۡضٖ تَمُوتُۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرُۢ ﴿٣٤﴾

## سُورَةُ السَّجۡدَةِ ٣٢ — ٣٠

(٢٤) کەمێك خۆشییان پێ دەدەین لەدنیادا، پاشان ناچاریان دەکەین بۆ سزایەکی دژوارو سەخت.

(٢٥) خۆ ئەگەر لەوان بپرسیت کە کێ ئاسمانانو زەوی دروستکردوە؟ بە بێ دوودڵی دەڵێن: الله، تۆیش بڵێ: سوپاس بۆ الله، بەڵکو زۆربەیان راستی نازانن.

(٢٦) خۆ ئەوەی لە ئاسمانانو زەویدایە موڵکی اللهیە، بەبێگومان الله هەر خۆیەتی بێ نیازو سوپاسکراو.

(٢٧) جا ئەگەر ئەوەی لەناو زەویدایە لە دارو درەخت هەرهەموی قەڵەم بێتو ئەم دەریایەی کەدەیناسن ئەگەر حەوت دەریای تری لەگەڵدا بێت هەموی مورەکەب بێت بۆ نوسینی وشەکانی الله هێشتا هەر وشەکانی الله تەواو نابێت، بەڕاستی الله بە تواناو کارزانە. ئەمە تێمان دەگەیەنێت کەناسینی بەتەواوی حەقیقەتی زاتو سیفەتەکانی الله لەسنوری عەقڵی مرۆڤ بەدەرەو لەبەر ئەوە دە بێ پەیرەوی لەرێنماییەکانی زاتی خۆیو پێغەمبەرەکەی بکەین بۆ ناسینیان ئەوەتە باشترینی بەندەکان کە پێغەمبەرمانەﷺ لەدوعایەکیدا دەفەرموێ:{لَا أُحْصِي ثَنَاءً عَلَيْكَ، أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ/ النسائي وغيره،صححه الالباني/ بەو شێوەی کەخۆت ستایشو سەنای خۆتت کردوە ناتوانم ستایشت بکەم}

(٢٨) بۆ الله دروستکردنو زیندوو کردنەوەی هەموتان وەك یەك کەس وایە، بەڕاستی الله بیسەری هەمو ڕازو نیازەکانتانەو بینەری هەمو کێشەو کارەکانتانە.

(٢٩) ئایا نەت بینیوە کە الله شەو دەخاتە ناو ڕۆژەوەو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەوەوەو خۆرو مانگی رامکردوە کە هەمویان هاتوچۆ دەکەن هەتا ماوەیەکی دیاریکراو، خۆبێگومان کەالله زۆر ئاگادارە بەوەی کە دەیکەن.

(٣٠) هەمو ئەوانە بەهۆی ئەوەیە کە بێگومان هەر زاتیاللهیە کە ڕاستەو ئەوانەی کە دەیانپەرستن جگە لەو شتانی پوچو بێ کەڵکن، جابێشك کە الله هەر خۆیەتی بڵند مەقامو گەورە.

(٣١) ئایا نەت بینیوە کە لەناو دەریادا کەشتی هاتوچۆ دەکات بەهۆی نیعمەتی اللهوە تا هەندێك لە بەڵگەکانی دەسەڵاتو زانایی خۆیتان پیشان بدات، بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ پەندو ئامۆژگاری لێ وەرگرتن بۆ هەمو زۆر خۆڕاگری فرەسوپاسگوزار. جا هەر کاتێك شەپۆلی دەریا وەکو چیاکان بدات بە سەریاندا زۆر بە پاڵفتەیو دور لەشیرکەوە هاوار دەکەنە الله بۆ ئەوەی ڕزگاریان بکات.

(٣٢) جا هەر کاتێکیش الله ڕزگاری کردنو گەیاندنیە وشکایی، ئەوسا هەندێکیان لە نێوان باوەڕو بێباوەڕیدانو هەندێکی تریان هەر لەسەر بێباوەڕیو ناسوپاسی دەمێننەوە، ئەوسا جگە لە هەمو خیانەتکارێکی بێباوەڕی سپڵە کەسێکی تر نکولی لە نیشانەکانی ئێمە ناکات.

(٣٣) ئەی خەڵکینە خۆتان لە تورەییو ڕقی پەروەردگارتان بپارێزنو لە ڕۆژێك بترسن کە نە هیچ باوکێك باری تاوانی فەرزەندی هەڵدەگرێتو نە هیچ فەرزەندێکیش تۆڵەدەرەوەیە لەجیاتی باوکیدا، بەڵکو هەر کەس هەڵگری باری تاوانی خۆیەتیو کەس لە جیاتی کەسدا سزا نادرێت، بێگومان کە بەڵێنی الله دێتەجێ، جا با ژیانی دنیا فریوتان نەدات، وە ئاواتی نابەبەجێو نادروستی شەیتان بە بەخشندەی الله فریوتان نەدات کە بە چاوەڕوانی بەخشینی الله دەست بدەنە گوناحو تاوان.

(٣٤) بەڕاستی زانینی کاتی هاتنی قیامەت هەر لەلای اللهیەو کەسی تر هیچی لێ نازانێت، وە عیلمو زانستی ناردنە خوارەوەی بارانو وردکرنەوەی بەتنۆك تنۆکیو بون بە مایەی بەرەکەت یان بەڵا بۆ خەڵك هەر لای ئەوە، وە ئەو دەزانێت لە ناو منداڵداندا چی هەیەو چۆن منداڵێکی لێ دەگیرسێت، تەواو یان کەم ئەندام، چاك یان خراپ، بەهەشتی یان دوزەخی، فەقیر یان دەوڵەمەند،

وەهەمو ئەو شتانەی کە جگە لەاللّٰه کەسی تر هیچ ئاگایەکی لێ نیە. خۆ هیچ کەسێکیش نازانێت بەیانی چی دەکاتو چی دێتە ڕێگای‌و چی بەسەر دێت لە خۆشی‌و ناخۆشیەکان و کەسیش نازانێت کە لە چ زەویەکدا دەمرێت، بەبێگومان اللّٰه زۆر زاناو ئاگاداره بەهەمونهێنیەکان.

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم پێنجانەی بە کلیلی نهێنیەکان داناوە کە دەفەرموێ:{ مَفَاتِحُ الْغَيْبِ خَمْسٌ إِنَّ اللَّهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السَّاعَةِ وَيُنَزِّلُ الْغَيْثَ وَيَعْلَمُ مَا فِي الْأَرْحَامِ وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ مَاذَا تَكْسِبُ غَدًا وَمَا تَدْرِي نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوتُ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ}ماناکەی هەمان مانای ئایەتەکەیەو پێویست بە نوسینی دووبارەناکاتەوە.

## ٣٢ سورەتی سەجدە ٣٠

سورەتی سەجدە کە سورەتی سی‌و دووهەمی قورئانە، سی ئایەتەو لە مەکەدا هاتووەتە خوارەوە، هەندێك وتوویانە جگە لە سێ ئایەتی‌و هەندێکی تر وتوویانە پێنج ئایەت لە ﴿ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمۡ عَنِ ٱلۡمَضَاجِعِ ... تاکو... وَقِيلَ لَهُمۡ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴾، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی حەفتاو سێهەمەو پاش سورەتی (النحل)و پێش (نوح) دابەزیوە.

لە سەحیحدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ : {كَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ، ﴿ الٓمٓ ۝١ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾ وە ﴿ هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ ... ﴾ / واتە: لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا سورەتی سەجدەو سورەتی ئینسانی خوێندوە}

لەم سورەتەدا لەو شتە نهێنیانە ﴿مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ ﴾ کە تەنها لە عیلمی پەروەردگارن باس دەکات کە لە کۆتای سورەتی پێشو واتە سورەتی لوقمان دا بە کورتی ناوبراون.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەلیف،لام، میم.

(٢) هیچ گومانی تێدا نیە کە دابەزینی ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەیە.

(٣) بەڵکو ئەوان دەڵێن: ئەوە درۆیەو خۆی هەڵی بەستوە، نەخێر ئەو پەراوە ڕاستەو لەلایەن پەروەردگارتەوەیە تا بەهۆی ئەوەوە گەلێك بترسێنیت کە لە پێش تۆدا هیچ ترسێنەرێك نەهاتوەتە لایان بەڵکو ئەوان ڕێگای ڕاست بدۆزنەوە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ لَا رَيۡبَ فِيهِ مِن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰهُۚ بَلۡ هُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكَ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أَتَىٰهُم مِّن نَّذِيرٖ مِّن قَبۡلِكَ لَعَلَّهُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٤﴾ يُدَبِّرُ ٱلۡأَمۡرَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ثُمَّ يَعۡرُجُ إِلَيۡهِ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥٓ أَلۡفَ سَنَةٖ مِّمَّا تَعُدُّونَ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦﴾ ٱلَّذِيٓ أَحۡسَنَ كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥۖ وَبَدَأَ خَلۡقَ ٱلۡإِنسَٰنِ مِن طِينٖ ﴿٧﴾ ثُمَّ جَعَلَ نَسۡلَهُۥ مِن سُلَٰلَةٖ مِّن مَّآءٖ مَّهِينٖ ﴿٨﴾ ثُمَّ سَوَّىٰهُ وَنَفَخَ فِيهِ مِن رُّوحِهِۦۖ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمۡعَ وَٱلۡأَبۡصَٰرَ وَٱلۡأَفۡـِٔدَةَۚ قَلِيلٗا مَّا تَشۡكُرُونَ ﴿٩﴾ وَقَالُوٓاْ أَءِذَا ضَلَلۡنَا فِي ٱلۡأَرۡضِ أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدِۭۚ بَلۡ هُم بِلِقَآءِ رَبِّهِمۡ كَٰفِرُونَ ﴿١٠﴾ ۩ قُلۡ يَتَوَفَّىٰكُم مَّلَكُ ٱلۡمَوۡتِ ٱلَّذِي وُكِّلَ بِكُمۡ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ تُرۡجَعُونَ ﴿١١﴾

(٤) اللّٰه ئەو زاتەیە کە ئاسمانانو زەوی‌و ئەوەی کە لە نێوانیاندا هەیە لە شەش ڕۆژدا دروستیکردوە، پاشان لەسەر تەختی فرمانڕەوایەتی خۆی بەو شێوەی کە شایانی ئەو زاتە بێت وەستا، کە جگە لەو زاتەش هیچ یارمەتیدەرو تکاکارێکتان نیە کە لە سزای ئەوڕۆژەی کەپێی دەگەن ڕزگارتان بکات، ئایاهەروا لاسارو دژ بە خوا دەبن‌و بەم پەراوە تەمێ نابن‌و بیر ناکەنەوەو سوودی لێ وەربگرن؟!

(٥) اللّٰه ئەو زاتەیە کە هەمو کاروبارەکان لە ئاسمانەوە بۆ زەوی بەڕێوە دەبات، پاشان لە ڕۆژێکدا کە بە گوێرەی ژمارەی ئێوە هەزار ساڵە جبرەئیل‌و فریشتەکانی تر کە لەگەڵیدان بەرز دەبنەوە بۆ لای ئەو جێگاو مەقامەی کە دیاریکراوە بۆیان.

تێبینی: لە ئایەتی چواری سورەتی (مەعارج)دا دەفەرموێ: ﴿ فِي يَوۡمٖ كَانَ مِقۡدَارُهُۥ خَمۡسِينَ أَلۡفَ سَنَةٖ ﴾ واتە لە ڕۆژێکدا کە ئەندازەی پەنجا هەزار ساڵە دەگونجێت ڕۆژەکانی هاتنی قیامەتو مانەوە لەو کاتانەدا هەندێ ڕۆژی هەزارو هەندێکی تری پەنجا هەزار ساڵ بێت، یان جۆری سزای بێباوەڕان پەنجا جۆر بێتو لەهەر جۆرێکیشدا هەزار ساڵ بمێنێتەوە. والله أعلم.

(٦) ئەوەزاتێکە زانەری نادیارو دیارەکانەو زۆر بە توانای بێنیهایەت میهرەبانە.

وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلْمُجْرِمُونَ نَاكِسُوا۟ رُءُوسِهِمْ عِندَ رَبِّهِمْ رَبَّنَآ أَبْصَرْنَا وَسَمِعْنَا فَٱرْجِعْنَا نَعْمَلْ صَٰلِحًا إِنَّا مُوقِنُونَ ﴿١٢﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَءَاتَيْنَا كُلَّ نَفْسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنْ حَقَّ ٱلْقَوْلُ مِنِّى لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجْمَعِينَ ﴿١٣﴾ فَذُوقُوا۟ بِمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَآ إِنَّا نَسِينَٰكُمْ ۖ وَذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلْخُلْدِ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ فَلَا تَعْلَمُ نَفْسٌ مَّآ أُخْفِىَ لَهُم مِّن قُرَّةِ أَعْيُنٍ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٧﴾ أَفَمَن كَانَ مُؤْمِنًا كَمَن كَانَ فَاسِقًا ۚ لَّا يَسْتَوُۥنَ ﴿١٨﴾ أَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْمَأْوَىٰ نُزُلًۢا بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٩﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فَسَقُوا۟ فَمَأْوَىٰهُمُ ٱلنَّارُ ۖ كُلَّمَآ أَرَادُوٓا۟ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَآ أُعِيدُوا۟ فِيهَا وَقِيلَ لَهُمْ ذُوقُوا۟ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٠﴾

﴿٧﴾ ئەو زاتە کەسێکە هەموو شتێکی بە جوانی دروستکردوە، خۆ لەسەرەتاشدا مرۆڤی لە قوڕ دروستکرد.

﴿٨﴾ پاشان نەوەی ئەوی لە دەرهێنراو لە ئاوێکی سوکی بێ نرخ دروستکرد.

﴿٩﴾ پاشان ڕێكو پێکی کرد، وە لە گیانی خۆی فووی بەو لەشەدا کردو مادەی بیستنو بینینو دڵی پێدا، ئێوە بە کەمی سوپاسگوزارنو زۆرترتان سپڵەو خوانەناسن.

﴿١٠﴾ جا دەڵێن: ئایا ئێمە ئەگەر لەناوی زەویدا پتوترکاینو شوێنەوارمان نەما، تازە دەبینەوە بە دروستکراوێکی نوێ؟! نەك هەر ئەوە بەڵکو ئەوان باوەڕیان بە گەیشتن بە پەروەردگارو زیندوبوونەوە نیە، جا ﷲ دەمکوتیان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١١﴾ ئەی محمد ﷺ پێیان بڵێ: ئەو فریشتەی کە ئێوەی پێ سپێرراوە بۆ مراندنتان هەر ئەوە بە فەرمانی ﷲ دەتان مرێنێت پاشان دەبرێنەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆتانو تۆڵەو پاداشتی کردارەکانتان دەداتەوە.

﴿١٢﴾ جا ئەگەر تۆ دەت دی ئەو کاتەی کە تاوانباران داماوو سەرشۆڕن لەخزمەت پەروەردگاریانداو دەیان وت: ئەی پە روەردگارمان وا ئێستا ئێمە فەرمودەی تۆمان بەچاکی بینیو بیستمان دەی بمانخەرەوە سەر زەوی، ئیتر کاری باش دەکەین، چونکە بەڕاستی ئێمە بە زیندو بوونەوەو حیساب یەقینمان پەیدا کرد، جا دەت زانی کە ئەوان بەدەستی خۆیان چۆن ژیانی هەمیشەیی خۆیان بەباد داوەو بۆهەمیشەش شەرمەندەو رسوان.

﴿١٣﴾ ئەگەر حەزمان لێبووایە هەمو کەسمان دەخستە سەر ڕێگای ڕاست، (بەڵام ئەوە ناکەین چونکە خەڵکمان بۆ تاقیکردنەوە دروست کردوەو دەبێت خۆیان سەر پشك بکرێن تا بە کەیفی خۆیان چاکە یان خراپە هەڵبژێرن) ئەوسا بڕیاری ئێمە دێتە دی کە وتومانە: بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەین لە تەواوی جنۆکەو مرۆڤ.

﴿١٤﴾ جا بەهۆی ئەوەی کە گەیشتن بەمرۆژەتان لە بیر چوبو، ئەوسا ئێمەیش ئەمرۆ لەوسزایەدا ئێوەلەبیرخۆمان دەبەینەوە جاپێیان دەوترێت: دەبچەژن سزای هەمیشەیی بەهۆی ئەو کردارەی کە کردوتانە. ئینجا پەروەردگار تێمان دەگەیەنێت کە چ کەسانێك باوەڕ بەم قورئانە دەهێنێنو دەفەرموێ:

﴿١٥﴾ هەر ئەوانە باوەڕ بە نیشانەکانی ئێمە دەهێنن کە هەر کاتێك بەو نیشانانەی ئێمە ئامۆژگاری بکرێن سەریان دەخەنە سەر زەوی بە سوجدەبردن، خۆ لەگەڵ سوپاسکردنی پەروەردگاریان بە پاكو بێ عەیبی یادی دەکەن، جا ئەوان خۆیان بە زل ناگرنو لەبەندایەتی کردن بۆخوا شەرم ناکەن.

﴿١٦﴾ ئەو کەسانەن کە بۆ بەندایەتی ﷲ لە شەودا لە پێخەفەکانیان دێنە دەرەوەو لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە لە کاتێکدا کە ترسیان هەیە لە سزاو چاوەڕوانی بەهەشتیش دەکەن، وە لەوەی کە پێمان داون دەبەخشن.لەفەرمودەدا هاتوە کە موعاز دەڵێ لەسەفەرێکدا لەخزمەت پێغەمبەرﷺ دا بوم رۆژێك لێی نزیك بومو دەرۆیشتین وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کردارێکم پێ بڵێ کەبمخاتە بەهەشتەوەو دورم بخاتەوە لەئاگر، فەرموی: {لَقَدْ سَأَلْتَنِي عَنْ عَظِيمٍ وَإِنَّهُ لَيَسِيرٌ عَلَى مَنْ يَسَّرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ تَعْبُدُ اللَّهَ وَلَا تُشْرِكْ بِهِ شَيْئًا وَتُقِيمُ الصَّلَاةَ وَتُؤْتِي الزَّكَاةَ وَتَصُومُ رَمَضَانَ وَتَحُجُّ الْبَيْتَ ثُمَّ قَالَ أَلَا أَدُلُّكَ عَلَى أَبْوَابِ الْخَيْرِ الصَّوْمُ جُنَّةٌ وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ وَصَلَاةُ الرَّجُلِ مِنْ جَوْفِ اللَّيْلِ قَالَ ثُمَّ تَلَا تَتَجَافَى جُنُوبُهُمْ عَنْ الْمَضَاجِعِ حَتَّى بَلَغَ يَعْمَلُونَ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِرَأْسِ الْأَمْرِ كُلِّهِ وَعَمُودِهِ وَذِرْوَةِ سَنَامِهِ قُلْتُ بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ رَأْسُ الْأَمْرِ الْإِسْلَامُ وَعَمُودُهُ الصَّلَاةُ وَذِرْوَةُ سَنَامِهِ الْجِهَادُ ثُمَّ قَالَ أَلَا أُخْبِرُكَ بِمَلَاكِ ذَلِكَ كُلِّهِ قُلْتُ بَلَى يَا نَبِيَّ اللَّهِ فَأَخَذَ بِلِسَانِهِ قَالَ كُفَّ عَلَيْكَ هَذَا فَقُلْتُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ وَإِنَّا لَمُؤَاخَذُونَ بِمَا نَتَكَلَّمُ بِهِ فَقَالَ ثَكِلَتْكَ أُمُّكَ يَا مُعَاذُ وَهَلْ يَكُبُّ النَّاسَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ أَوْ عَلَى مَنَاخِرِهِمْ إِلَّا حَصَائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ /الترمذيوغيره.صححه الالباني/ بەراستی لەبارەی شتێکی گەورەوە

پرسیارت کرد، خۆ ئەوە ئاسانیشە لەسەر ئەو کەسەی کە خوا بۆی ئاسان بکات، خودا بپەرستەو هیچ هاوبەشێکی بۆ دامەنێ ونوێژ بکەو زەکات بدەو رۆژوی رەمەزان بگرەو حەجی بەیت بکە، پاشان فەرموی: ئایا هەمو دەرگاکانی چاکەت پیشان بدەم؟ رۆژو قەڵغانە وچاکە تاوانەکان دەکوژێنێتەوەهەروەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، وە نوێژی پیاو لەناوی شەودا . وتی: پاشان﴿ئەوکەسانەن کەبۆ بەندایەتی اللّٰه لە شەودا لە پێخەفەکانیان دێنەدەرەوە ـ تا گەیشتەـ کردارەی کە کردوویانن﴾ی خوێندەوە،پاشان فەرموی: ئایا پێت بڵێم بەسەری ئەم کارەو کۆڵکەو سەنگەری هەرە بەرزی؟وتم:بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: سەری ئەم کارە ئیسلامەو کۆڵەکەکەی نوێژەو سەنگەری هەرە بەرزیشی جیهادە، پاشان فەرموی: ئایا پێت بڵێم ئەوەی کە ئەمانە هەموی بتەوو بەهێز دەکات؟وتم بەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ جازمانی خۆی گرت، فەرموی: ئەمە بگرە، جا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺئایا ئێمە تۆڵەمان لێوەردەگیرێت لەسەر ئەو قسانەی کە بەو دەیکەین؟جا فەرموی: لەباری دایکت چی ئەی موعاز ئەی خەڵکی جگە لەسەر قسەکانی زمانیان چی ترە کەبە دەموچاویان یان بەسەرلوتیاندا دەیانخاتە ناو ئاگرەوە؟} ئینجا دەفەرموێ:

(١٧) ئەوسا هیچ مرۆڤێکی چاك نازانێ کە چیی بۆ پەنهان کراوە لەوانەی کەدڵ خۆشکەرو چاو ڕۆشنکەرەوەن بۆی کەپاداشتێکی گەورەیە بەهۆی ئەو کردارە چاکانەی کە دەیکەن. لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کە موسا عليه السلام پرسیاری لە پەروەردگاری کردو وتی:{یَارَبِّ مَا أدنَى أَهلِ الجَنَّةِ مَنزِلَةً قَال: هُوَ رَجُل يَأتِي بَعدَ مَايَدخُلُ أَهلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ فَيُقَالُ لَهُ أدخُلِ الجَنَّةَ فَيَقُولُ: اي رَبِّ كَيفَ وَقَد نَزَلَ النَّاسُ مَنَازِلَهُم وَأَخَذُوا أخذَاتِهِم فَيُقَالُ لَهُ أَتَرضَى أَن يَكُونَ لَكَ مِثل مُلكِ مَلِكٍ مِن مُلُوكِ الدُّنيَا فَيَقُولُ: رَضِيتُ رَبَّ فَيَقُول: لَكَ ذَلِكَ وَمِثلَهُ وَمِثلَهُ مَعَهُ وَمِثلَهُ وَمِثلَهُ وَمِثلَهُ وَمِثلَهُ فَقَال: فِي الخَامِسَةِ رَضِيتُ رَبِّ فَيُقَالُ هَذَا لَكَ وَعَشرَةُ أَمثَالِهِ وَلَكَ مَا اشتَهَت نَفسُكَ وَلَذَّت عَينُكَ فَيَقُولُ: رَضِيتُ رَبِّ قَالَ: رَبِّ فَأَعلاها مَنزِلَةً؟ قَال: أولَئكَ الَّذينَ اَرَدتُ غَرَستُ كَرَامَتَهُم بِيَدِيّ وَخَتَمتُ عَلَيهَا فَلَم تَرَ عَينٌ وَلَم تَسمَع أُذُنٌ وَلَم يَخطُر عَلَى قَلبِ بَشَرٍ – قَالَ وَمِصدَاقُهُ مِن كِتَابِ الله قَولُهُ تَعالى ﴿ فَلَا تَعۡلَمُ نَفۡسٞ مَّآ أُخۡفِيَ لَهُم ... ﴾ /مسلم/ ئەی پەروەردگارم لاخوار ترین جێگای خەڵکی بەهەشت کامەیە؟ فەرموی: پیاوێکە پاش ئەوەی کە خەڵکی بەهەشت چوونە بەهەشتەوەو هەر کەس جێگای خۆی گرت، دێتو پێی دەوترێت: بچۆرە بەهەشتەوە، جا ئەویش دەڵێت: ئەی پەروەردگارم چۆن بچمە بەهەشتەوە بەڕاستی خەڵك جێگای خۆیان گرتوەو بەشی خۆیان وەرگرتوە، جا پێی دەوترێت:

وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَدۡنَىٰ دُونَ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡأَكۡبَرِ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ (٢١) وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ثُمَّ أَعۡرَضَ عَنۡهَآۚ إِنَّا مِنَ ٱلۡمُجۡرِمِينَ مُنتَقِمُونَ (٢٢) وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡكِتَٰبَ فَلَا تَكُن فِي مِرۡيَةٖ مِّن لِّقَآئِهِۦۖ وَجَعَلۡنَٰهُ هُدٗى لِّبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ (٢٣) وَجَعَلۡنَا مِنۡهُمۡ أَئِمَّةٗ يَهۡدُونَ بِأَمۡرِنَا لَمَّا صَبَرُواْۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يُوقِنُونَ (٢٤) إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَفۡصِلُ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ (٢٥) أَوَلَمۡ يَهۡدِ لَهُمۡ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ يَمۡشُونَ فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٍۚ أَفَلَا يَسۡمَعُونَ (٢٦) أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا نَسُوقُ ٱلۡمَآءَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡجُرُزِ فَنُخۡرِجُ بِهِۦ زَرۡعٗا تَأۡكُلُ مِنۡهُ أَنۡعَٰمُهُمۡ وَأَنفُسُهُمۡۚ أَفَلَا يُبۡصِرُونَ (٢٧) وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡفَتۡحُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ (٢٨) قُلۡ يَوۡمَ ٱلۡفَتۡحِ لَا يَنفَعُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِيمَٰنُهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنظَرُونَ (٢٩) فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَٱنتَظِرۡ إِنَّهُم مُّنتَظِرُونَ (٣٠)

## ٣٣ سُورَةُ الأَحۡزَابِ ٧٣

ئایا ڕازی دەبیت کە بە ئەندازەی سامانی پاشایەك لە پاشاکانی دنیات هەبێت؟ ئەویش دەڵێ: ئەی پەروەردگارم ڕازیم، جا پەروەردگار پێی دەفەرموێ: ئەوە بۆ تۆو ئەوەندەو ئەوەندەی تریشی لەگەڵ بێت ئەوەندەی ئەوو ئەوەندەی ئەوو ئەوەندەی ئەوو ئەوەندەی ئەو، ئەوسا لە جاری پێنجەمدا وتی: ئەی پەروەردگارم ڕازیم، جا پێی دەفەرێ: ئەمە بۆ تۆو دە ئەوەندەی ئەویشو هەرچیش ئارەزۆی دەکەیتو چاوت پێی خۆشە بۆت هەیە، جا دەڵێت: ئەی پەروەردگارم ڕازیم، موسا وتی: ئەی پەروەردگارم ئەی لاژوورترین جێگاکامەیە؟ فەرموی: ئەوانەی کە هەڵمبژاردوون کە بە دەستی خۆم کەرەمو ڕێزم بۆ چاندوونو سەرم مۆرکردوە کە هیچ چاوێك نەیبینیوەو هیچ گوێیەك نەیبیستوەو نەهاتوە بە دڵی هیچ مرۆڤێکیشدا) پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوەی کە ئەم ڕاستیەش دەسەلمێنێ لە پەڕاوی اللّٰهدایە ﴿ ئەوسا هیچ مرۆڤێکی چاك نازانێ کە چیی بۆ پەنهان کراوە لەوانەی کە دڵ خۆشکەرو چاو ڕۆشنکەرەوەن بۆی کە پاداشتێکی گەورەیە بەهۆی ئەو کردارە چاکانەی کە دەیکەن﴾ }

(١٨) ئایا ئەو کەسەی کە باوەڕی هێناوە وەکو ئەو کەسەیە کە لە ڕێگای اللّٰه لای داوە؟ (نەخێر) وەکو یەك نین. ئینجا جیاوازیەکانیان باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٩) جا ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە ئەوسا بە بەباخچەکانی جێگای دانیشتن‌و مانەوەو حەسانەوە ئەوانە پێشوازیان لێ دەکرێت‌و ڕێزیان لێدەگیرێت ئەوەش بەهۆی ئەو کردارانەی کە کردویانن.

(٢٠) بەڵام ئەوانەی کە لە دژایەتی کردنی اللهو پێغەمبەرﷺو ئیسلامدا لە سنوور دەرچوون جێگایان ئاگرەو هەر کاتێك بیانەوێت لەو دەربچن دووبارە دەیانگێڕنەوە بۆ ناوی‌و پێیان دەوترێ: بچەژن سزای ئەو ئاگرەی کە ئێوە باوەڕتان پێی نەبو.

(٢١) جا بێگومان پێتان دەچەژێنین لە سزای ئەم دنیایە پێش هاتنی سزای گەورەی دوارۆژ بەڵکو بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست. واتە: سزای دنیا بۆ ئەوەیە کەخەڵکی پەندی لێوەربگرێت‌و پێی خۆشبەخت ببێت.

(٢٢) جا کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە بە نیشانەکانی پەروەردگاری ئامۆژگاری بکرێت پاشان ئەو پشتی تێبکات؟ بەبێگومان کە ئێمە تۆڵە لە ستەمکاران وەردەگرین‌و لەبیرمان ناچن.

(٢٣) بەڕاستی تەوراتمان دا بە موسا جا تۆ گومانت نەبێت لە پێگەیشتن‌و بینینی ئەو (مەبەست پێگەیشتنی پێغەمبەرمان ﷺ بە موسا عليه السلام لە شەوی میعراجدایە، یان پێگەیشتنی تەورات بۆ موسا یان پێگەیشتنی تۆ بۆ ئەم قورئانە )خۆ ئەومان کردوە بە ڕێنمونیکەری نەوەی ئیسرائیل.لەفەرمودەدا هاتوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: { مَرَرْتُ لَيْلَةَ أُسْرِيَ بِي عَلَى مُوسَى بْنِ عِمْرَانَ عليه السلام رَجُلٌ آدَمُ طُوَالٌ جَعْدٌ كَأَنَّهُ مِنْ رِجَالِ شَنُوءَةَ /مسلم/ ئەو شەوەی کە شەوڕەویم پێکرا دام بەلای موسای کوڕی عیمراندا سەلامی خوای لێبێت پیاوێکی گەنم ڕەنگی درێژی قژ کرژ بو هەروەکو پیاوانی شەنوئە وابو}.

(٢٤) جا لەناو ئەواندا بەهۆی ئەوەی کە خۆیان گرت لەسەر ئێش‌و ئازارو بەردەوامبون لەسەر گەیاندنی تەورات‌و بەجێ هێنانی فەرمانەکانی، پێشەوا گەلێکمان دانا جا ئەوان دڵنیابون بە نیشانەکانی یەکخواپەرستیی‌و تواناو هێزی ئێمە.

(٢٥) بەڕاستی پەروەردگارت هەر خۆیەتی لە ڕۆژی قیامەتدا لە یەکیان جیا دەکاتەوەو بە هەر کەسێك بەرهەمی کرداری خۆی پێدەدات‌و تێیان دەگەیەنێت کە کامیان ڕاستبون لەو شتانەی کە ناڕێك بون تێیدا لەسەر دنیادا.

(٢٦) ئایا ئەو هەمو خەڵکەی پێش ئەمان کە بە جێگاو ڕێگای ئەواندا هاتوچۆ دەکەن‌و بە چاوی خۆیان دەبینن کە چۆن لەناومان بردن نابن بەهۆی ڕێنمایی‌و ژیربونی ئەمان؟ بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە لەسەر هێزو دەسەڵاتی ئێمە ئایا داستانی بەسەرهاتی گەلان‌و پەیامی ئەم پێغەمبەرەی ﷺ ئاخر زەمان نابیسن؟واتە ژیربن‌و بانگەوازی ئەم پەیامە ببیسن‌و بەچاکی وەری گرن تا دوچاری سزاکانی وەك ئەوان نەبن.

(٢٧) ئایا نابینن کە ئێمە ئاو دەنێرین بۆ ئەو زەویانەی کە وشك‌و بێ گژوگیاو بێ ئاون، ئەوسا بەو شینایی‌و کشتوکاڵ دەڕوێنین کە خۆیان‌و ماڵاتەکانییان لێی دەخۆن، ئایا ئەمە بە چاوی خۆیان نابینن؟ دەی چاو بکەنەوەو ڕاستیەکان ببینن تالەپاشەرۆژدا گرفتار نەبن.

(٢٨) خۆ دەڵێن: ئەگەر ڕاست دەکەن کەی کاتی ئەم جیا کردنەوەی ئێمەو ئێوە دێت؟

(٢٩) بڵێ: ڕۆژی جیاکردنەوە کە هات تازە باوەڕ هێنانی خوانەناسان هیچ سوودێکیان پێنادات‌و ماوەیشیان پێنادرێت بۆ پەشیمان بوونەوەو بەهانە هێنانەوە.

(٣٠) جا تۆ پشتیان تێ بکەو چاوەڕوانبە بۆ فەرمانی پەروەردگارت بێگومان کەئەوانیش چاوەڕوانی مردنی تۆ دەکەن وا دەزانن بەمردنی تۆ کۆتای بەم پەیامە دێت. سا با دڵنیا بن کە سەر ئەنجامی چاك هەر بۆ پارێزکارانەو خوانەناسان بەشیان هەر لەناوچون‌و نەمانە جا با هەردوولا چاوەڕوانبن.

## ٣٣ سورەتی ئەحزاب ٧٣

سورەتی ئەحزاب کە سورەتی سی‌وسێهەمی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، حەفتاو سێ ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی نەوەدەو پاش سورەتی (الأنفال)و پێش (المائدة) دابەزیوە. مەبەست لە وشەی ﴿ٱلۡأَحۡزَابَ﴾ لەم سورەتەدا هەمو ئەو پارت‌و حیزبانەیە کە لەگەل قورەیشدا بۆ لەناوبردنی پێغەمبەرﷺو موسڵمانان سوپایەکی دەهەزار کەسیان پێکهێناو هێرشیان کردە سەر موسڵمانان، ئەم ڕوداوە لە ساڵی پێنجەمی کۆچیدا ڕویداوەو بە غەزای ئەحزاب یان خەندەق بەناوبانگەو ئەم سورەتەش باسی ئەو ڕوداوە بەرونی‌و هەڵوێستی هەمو لایانەکانی دەکات، جا پێغەمبەر ﷺبە یەکێك لە ناوە پیرۆزەکانی پەروەردگار کە(هَازِمُ الْأَحْزَابِ)ە دوعای بۆ لەناو بردنی ئەم حیزبانە کردوەو فەرمویەتی: {اللَّهُمَّ مُنْزِلَ الْكِتَابِ سَرِيعَ الْحِسَابِ هَازِمَ الْأَحْزَابِ اللَّهُمَّ اهْزِمْهُمْ وَزَلْزِلْهُمْ/ مسلم وغيره/ ئەی خودایە کەدابەزێنەری ئەم پەراوەیت، کە بەپەلەی لە حیسابدا، تێکشکێنەری حیزبەکانی، ئەی خودایە تێکیان بشکێنەو وچانو

ورونگیان پێ نەدەیت } جا پەروەردگاریش دوعاکەی وەرگرتو ئەو حیزبانەی تێکو پێك دا. دیارە لە کۆتای سورەتی پێشودا پەروەردگار فەرمان دەدات بە پێغەمبەر ﷺ کە پشت لە بێباوەڕان بکات، جا لە سەرەتای ئەم سورەتەیش فەرمانی پێدەدات کە لە ﷲ بترسێتو گوێرایەڵی بێباوەڕانو دووڕویان نەکات.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی پێغەمبەرﷺ بەردەوام بە لەسەر پارێزکاریو ترسان لەﷲ، وە پەیڕەوی خوانەناسانو دووڕووان مەکە بەڕاستی ﷲ زاناو دانایە.

(٢) جا پەیڕەوی لەو قورئانە بکە کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دێت بەبێگومان ﷲ زۆر بە ئاگایە لەوەی کە ئێوە دەیکەن

(٣) جا لە هەمو کاروبارتدا پشت ببەستە بە ﷲ خۆ بەسە کە ﷲ پشتیوانت بێت، جا ئەوەی کە ﷲ پشتیوانی بێت کێ دەتوانێ پشتی لەزەوی بدات؟

(٤) ﷲ بۆ هیچکەس لە ناوسینگیا دوو دڵی دانەناوە واتە کەس ناتوانێت دوو بیرو بۆچوونی جیا لە یەك لە دڵدا دانێت. وەك پێغەمبەرمان دەفەرموێ:{لَا يَجْتَمِعُ الإِيمَانُ وَالْكُفْرُ فِي قَلْبِ امْرِئٍ/السلسلة الصحيحة/ ئیمانو کوفر لەدڵی کەسدا بەیەکەوە کۆنابنەوە} ئەگەر کەسێك موسڵمان بێت ناتوانێت ڕێگاو ڕێبازێکی تر بخاتە ناو دڵیەوە خۆ ئەگەر خستیە دڵیەوە درۆ دەکات موسڵمان نیە. وەئەو هاوسەرانەی کەﷲ پێیداونو پێیان دەڵێن: ئێوە وەکو پشتی دایکمان وانو دەیچوێنن بەوانەوە، ﷲدای نەناون بە دایکتانو قسەیەکی پوچەو دەبێت تۆڵەی بدەن. وە ئەو کەسانەی بە دەمی خۆتان بە کوڕی خۆتانی دادەنێن، کوڕتان نین، ئەوە قسەیەکەو بە دەمی خۆتان داتاناوەو هەر ﷲیە ڕاست دەفەرموێو هەر خۆیشی ڕێنمونی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست، لە عەبدوڵای کوڕی عومەرەوە ﵁ هاتوە کە دەڵێت: زەیدی کوڕی حاریسەی خزمەتکاری پێغەمبەرمان ﷺ بە زەیدی کوڕی محمد بانگ دەکرد تا ئەم ئایەتە دابەزی. لە خاتون عائیشەوە هاتوە کە سەهلەی کچی سوهەیل کە خێزانی ئەبو حوزەیفەی کوڕی عوتبە بو هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە لە پێشدا سالمان بە کوڕی خۆمان بانگ دەکرد جا ﷲ لەو بارەوە ڕەوانەی کردوە ئەوەی کە ڕەوانەی کردوە، وە ئەو دێت بۆ لامو من هەست دەکەم کە ئەبو حوزەیفە لەبەر دڵی گرانە، جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{أَرْضِعِيهِ تَحْرُمِي عَلَيْهِ /النسائي.صححه الالباني/ شیری بدەرێ ئیتر تۆ لێی مەحرەم

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ ۗ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا (١) وَاتَّبِعْ مَا يُوحَىٰ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۚ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا (٢) وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَكِيلًا (٣) مَّا جَعَلَ اللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِ ۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَاجَكُمُ اللَّائِي تُظَاهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَاتِكُمْ ۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ ۖ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ (٤) ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ ۚ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ ۚ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَٰكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (٥) النَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ ۗ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَىٰ أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا (٦)

دەبێت وەکو دایکی} وتراوە کە ئەم ئایەتە لەم بارەوە دابەزیوە. والله أعلم.

(٥) جا ئێوە بە ناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن، لە لای ﷲ هەر ئەوەیە دادپەروەرانە جا ئەگەر باوکیانتان نەدەزانی ئەوسا ئەوان برای ئایینیتانو خزمەتکارو دۆستتانن، لەوەی کە بە هەڵە بەوناوە ناویان دەبەن تاوانتان لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر بە دڵ بە ئەنقەست وا بڵێن تاوانبارن، وە ﷲ زۆر لێبوردەو بە سۆزە بۆ بەندەکانی.

(٦) پێغەمبەر ﷺ دڵسۆزترو خەمخۆرترەو پێشترە بۆ باوەڕداران لە خۆیان بۆ خۆیان. وە خێزانەکانی دایکیانن لە قەدەغە بونی نکاحیانو ڕێز لێ گرتنیاندا، وە لە بڕیاری ﷲدا خزمان لە میراتدا هەندێکیان لە پێشترن لە هەندێکیان لەپەیوەندی دۆستایەتیو برایەتی نێوان یارمەتیدەرانو کوچکەراندا مەگەر خۆتان بتانەوێ چاکەیەك لەگەڵ دۆستانتاندا بکەن. هەرلەکۆنەوە ئەمە لە (لوح المحفوظ)دا تۆمار کراوە. وەلەفەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: { مَا مِنْ مُؤْمِنٍ إِلَّا وَأَنَا أَوْلَى بِهِ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ اقْرَءُوا إِنْ شِئْتُمْ النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ فَأَيُّمَا مُؤْمِنٍ مَاتَ وَتَرَكَ مَالًا فَلْيَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كَانُوا وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَلْيَأْتِنِي فَأَنَا مَوْلَاهُ /البخاري/ هیچ باوەڕدارێك نیە کەمن لەپێشتر نەبم بۆی لەدنیاو دوارۆژدا. ئەگەر ئارەزۆتان هەییە ﴿پێغەمبەر ﷺ دڵسۆزترو خەمخۆرترەو پێشترە بۆ باوەڕداران لە خۆیان بۆ

وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِيثَٰقَهُمۡ وَمِنكَ وَمِن نُّوحٖ وَإِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۖ وَأَخَذۡنَا مِنۡهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظٗا ﴿٧﴾ لِّيَسۡـَٔلَ ٱلصَّٰدِقِينَ عَن صِدۡقِهِمۡۚ وَأَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ إِذۡ جَآءُوكُم مِّن فَوۡقِكُمۡ وَمِنۡ أَسۡفَلَ مِنكُمۡ وَإِذۡ زَاغَتِ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَبَلَغَتِ ٱلۡقُلُوبُ ٱلۡحَنَاجِرَ وَتَظُنُّونَ بِٱللَّهِ ٱلظُّنُونَا۠ ﴿١٠﴾ هُنَالِكَ ٱبۡتُلِيَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَزُلۡزِلُواْ زِلۡزَالٗا شَدِيدٗا ﴿١١﴾ وَإِذۡ يَقُولُ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ مَّا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ إِلَّا غُرُورٗا ﴿١٢﴾ وَإِذۡ قَالَت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ يَٰٓأَهۡلَ يَثۡرِبَ لَا مُقَامَ لَكُمۡ فَٱرۡجِعُواْۚ وَيَسۡتَـٔۡذِنُ فَرِيقٞ مِّنۡهُمُ ٱلنَّبِيَّ يَقُولُونَ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوۡرَةٞ وَمَا هِيَ بِعَوۡرَةٍۖ إِن يُرِيدُونَ إِلَّا فِرَارٗا ﴿١٣﴾ وَلَوۡ دُخِلَتۡ عَلَيۡهِم مِّنۡ أَقۡطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُواْ ٱلۡفِتۡنَةَ لَأٓتَوۡهَا وَمَا تَلَبَّثُواْ بِهَآ إِلَّا يَسِيرٗا ﴿١٤﴾ وَلَقَدۡ كَانُواْ عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ مِن قَبۡلُ لَا يُوَلُّونَ ٱلۡأَدۡبَٰرَۚ وَكَانَ عَهۡدُ ٱللَّهِ مَسۡـُٔولٗا ﴿١٥﴾

خۆیان۞ بخوێننەوە، جا هەر باوەڕدارێك مردو ماڵی لێ بەجێما باخزمەكانی هەركەس هەن بیبەن، خۆ ئەگەر قەرزێكی بەلاوە بو یان منداڵی لێ بەجێما بو، ئەوسا با بێت بۆ لای من چونكە هەر منم دۆستویارمەتی دەر بۆ ئەو}

(٧) بیخەرەوە بیریان ئەو كاتەی كە پەیمانمان وەرگرت لە تەواوی پێغەمبەرانو لە تۆو لە نوحو ئیبراهیمو موساو عیسای كوڕی مەریەم كە بەندایەتی ﷲ بكەنو خەڵكی بانگ بكەن بۆ بەندایەتی، وە پەیمانی بتەوو بەهێزمان لێ وەرگرتن.

(٨) تا ﷲ پرسیار بكات لە ڕاستگۆیان سەبارەت بە ڕاستیان لە بەجێهێنانی ئەو پەیمانە، ئەوسا سزای بەئازاریشی ئامادە كردوە بۆ خوا نەناسان.

(٩) ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە بیر بكەنەوە لەو نیعمەتە گەورەی ﷲ كە ڕژاندی بە سەرتاندا ئەو كاتەی كە سەرباز گەلێكی زۆر هاتنە سەرتان لە ڕۆژی (خەندەق)دا، ئەوسا ئێمە بە باوو بە سەرباز گەلێك كە ئێوە نەتانبینیون دامان بە سەریاندا كە چادرەكانیانی لە بن هێنانو ئاگرەكانی كوژاندنەوەو دێزەكانی سەرنخون كردنو بەردو زیخولمبارانی كردنو لەوانیش تێ نەدەپەڕی، وەبەڕاستی ﷲ بینەری ئەو كارانەیە كە ئێوە دەیكەن.

(١٠) ئەو كاتەی كە لە لای سەرەوەو لە خوارەوەتان هاتن بۆتانو ئەو كاتەی كە چاوەكان ئەبڵەق بونو گیانەكان گەیشتنە گەروو گومانتان دەبرد بە ﷲ چۆن گومانێك، واتە: وایان دەزانی كە تازە سەركەوتن قسەیەكی نەگونجاوە. لە فەرمودە دا هاتوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ نُصِرْتُ بِالَّصبَا، وَأُهلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ/متفق عليه/ من بە بای سەبا كە لە ڕۆژهەڵاتەوە دێتو خۆشوفێنكە یارمەتی درام، وە عادیش بە دەبور كە بایەكە لە ڕۆژئاواوە دێت لەناوبران} .

(١١) ئا لەوێدا تاقیكردنەوەی باوەڕداران هاتە كایەوەو لەرزێنران بە لەرزاندێكی توند، چونكە كەوتنە تەنگانەیەكی زۆر سەختو دژوارەوە كە نزیكبو باوەڕیان نەمێنێت بە سەركەوتن،

(١٢) جا بەبیر بهێنەوە ئەو كاتەی كە دووڕووەكانو ئەوانەی كە لە ناو دڵیاندا نخۆشی دوور لە ﷲیان تێدا بو دەیان وت: ﷲو پێغەمبەرەكەی ﷺ جگە لە دەستخەڕە كردنمان هیچ بەڵێنێكی تریان پێنەداوین، وە ئەو بەڵێنی سەركەوتنە فریودانێك زیاتر نەبو، ئەمە لە لایەكەوەو لە لایەكی ترەوە خەریكی ساردكرنەوەی باوەڕداران بون تا گۆڕەپانی جیهاد چۆڵ بكەن.

(١٣) جا دیسان بە بیر بهێنەوە ئەو كاتەی كە كۆمەڵێك لەو دووڕوو دڵ نخۆشانە بانگیان لە خەڵكی مەدینە كردو وتیان: ئەی خەڵكی یەسریب ئەمە جێگای وەستانتان نیەو ناتوانن خۆبگرن سا بگەڕێنەوە بۆ ناو شار، جا هەندێكیان داوای گەڕانەوەیان لە پێغەمبەر ﷺ دەكردو دەیان وت: بێگومان كە ماڵەكانمان بێ سەرپەرستەو كەسمان نیە چاوی لێیان بێت، لەراستیدا ماڵیان بێ سەرپەرست نەبو ئەمە جگە لە بەهانەیەك بۆ ڕاكردنو چۆڵكردنی گۆڕەپانی جیهاد شتێكی تریان مەبەست نەبو، جا دووروەكان ئەوەندە دژ بە پێغەمبەرﷺو باوەڕداران بون كە زمانیان هەڵ نەدەهات بڵێن: مەدینە بەڵكودەیان وت: یەسریب تا بەم شێوەیەش دڵی پێغەمبەر ﷺ و باوەڕداران زیاتر ئازار بدەن.

(١٤) جا ئەگەر لە هەمو لایەكەوە هێرش بهاتایە سەریان، پاشان داوایان لێ بكرایە كە ببنەوە بە موشرییك زۆریان پێ نەدەچوو وایان دەكردو خۆیان دەخستە ڕێزی موشریكانەوە.

(١٥) جا بەڕاستی ئەوان پێش غەزای خەندەق كە ڕێزو نرخی غەزاكەرانی بەدریان بیستبو پەیمانیان بە ﷲدا كە ئەگەر بێتو ئەم جارە غەزایەكی تر بێت چالاكانە هاوكاری تێدا بكەنو پشت نەكەنە بەرەی جیهاد بەڵام وا غەزای خەندەق دەستی پێكردو مەردانی ڕاستو دروست بە فەرمانی پێغەمبەر ﷺ خەریكی هەڵكەندنی خەندەقن كەچی ئەوانیش وا خەریكی

قُل لَّن يَنفَعَكُمُ ٱلْفِرَارُ إِن فَرَرْتُم مِّنَ ٱلْمَوْتِ أَوِ ٱلْقَتْلِ وَإِذًا لَّا تُمَتَّعُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٦﴾ قُلْ مَن ذَا ٱلَّذِى يَعْصِمُكُم مِّنَ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَ بِكُمْ سُوٓءًا أَوْ أَرَادَ بِكُمْ رَحْمَةً ۚ وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧﴾ ۞ قَدْ يَعْلَمُ ٱللَّهُ ٱلْمُعَوِّقِينَ مِنكُمْ وَٱلْقَآئِلِينَ لِإِخْوَٰنِهِمْ هَلُمَّ إِلَيْنَا ۖ وَلَا يَأْتُونَ ٱلْبَأْسَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٨﴾ أَشِحَّةً عَلَيْكُمْ ۖ فَإِذَا جَآءَ ٱلْخَوْفُ رَأَيْتَهُمْ يَنظُرُونَ إِلَيْكَ تَدُورُ أَعْيُنُهُمْ كَٱلَّذِى يُغْشَىٰ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْمَوْتِ ۖ فَإِذَا ذَهَبَ ٱلْخَوْفُ سَلَقُوكُم بِأَلْسِنَةٍ حِدَادٍ أَشِحَّةً عَلَى ٱلْخَيْرِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَمْ يُؤْمِنُوا۟ فَأَحْبَطَ ٱللَّهُ أَعْمَٰلَهُمْ ۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٩﴾ يَحْسَبُونَ ٱلْأَحْزَابَ لَمْ يَذْهَبُوا۟ ۖ وَإِن يَأْتِ ٱلْأَحْزَابُ يَوَدُّوا۟ لَوْ أَنَّهُم بَادُونَ فِى ٱلْأَعْرَابِ يَسْـَٔلُونَ عَنْ أَنۢبَآئِكُمْ ۖ وَلَوْ كَانُوا۟ فِيكُم مَّا قَٰتَلُوٓا۟ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢٠﴾ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾

ساردکردنەوەی موسڵمانانو دابەزاندنی وورەیانو هەموو بەڵێنێکیان لە بیر خۆیان بردوەتەوە، وەك ئەوەی کە هیچ نەوترابێت، بەڵام بەڵێندان بە ﷲ لێ پرسینەوەی هەیە.

﴿١٦﴾ جا پەروەردگار دەفەرموێ: پێیان بڵێ: ڕاکردن لە مردن یان لە کوشتن هیچ سوودێکتان پێنادات، چونکە ئەگەر لە مەیدانیش دا هەڵ بێن هەر تەنها ئەو ماوە کەمە دەژین کە بۆتان دانراوە، چونکە کاتی دیاری کراوبە هیچکەس ناگۆڕێت.

﴿١٧﴾ دەبلێ: کێیە کە لە ﷲ دەتانپارێزێت ئەگەر ﷲ بیەوێت توشی بەڵایەکتان بکات یان چاکەیەکتان لەگەڵدا بکات؟ وە ئەوان جگە لە ﷲ هیچ دۆستو یارمەتیدەرێکی تریان دەست ناکەوێت.

﴿١٨﴾ بەراستی ﷲ خۆی دەزانێت کە چ کەسێك لە ئێوە خەڵك سارد دەکاتەوەو بە براکانی دەڵێت : بێنەوە بۆ لامانو واز لە غەزا بهێنن، وەهەر کەمێکیان لەو شەڕەدا بەشداربوون ئەویش بۆ چاوبەستکردنی باوەڕدارانو بۆ خۆنواندن بو. چاوچنۆکنو پێیان ناخۆشە کە ئێوە خێرێکتان دەستکەوێت، جا هەر کاتێك ترس ڕووبدات تۆ دەبینیت ئەوان کە تەماشات دەکەن چاویان لە ترسا بەم لاو بەولادا دەسوڕێتەوە وەك ئەو کەسەی کە لە سەرەمەرگدا بێت بەڵام کە ترس نەماو سوودتان دەست کەوت بە زمانێکی تیژەوە ئاوێزانتان دەبنو زۆر سوورن لەسەر بەشداربونیان لەو ماڵەی کەدەستتان کەوتوە.

﴿١٩﴾ بەڕاستی ئەوان باوەڕی ڕاستەقینەیان نەبوە لەبەر ئەوە ﷲ کرداره چاکەکانیانی لێ هەڵوەشاندنەوەو ئەمەیش لەلای ﷲ شتێکی ئاسانە.

﴿٢٠﴾ ئەم دووڕووانە وا دەزانن کە حیزبەکان (قورەیشو غەتەفانو جولەکە) کە بۆ لەناوبردنی باوەڕداران بون بەیەك تا هەموویان لەناونەبن، ناچنەوە، جا ئەگەر جارێکیتر ئەو حیزبانە بێنەوە ئەم دووڕووانە ئاوات دەخوازن کە لەناو عەرەبە دەشتیەکاندا بوونایەو هەر لەدووره هەواڵی ئێوەیان پرسیار بکردایە کە چیتان بەسەر هاتوە؟ خۆ ئەگەر ئەوان لەناو ئێوەشدا بوونایە هەر تەنها کەمێکیان شەڕیان دەکرد، ئەویش لەبەر عەیبەو خۆنواندن جا بەراستی بونی ئائەم جۆرە کەسانە لەناو ریزی موسڵماناندان هیچ خەیرێکی پێوە نیەو باموسڵمان ئاواتی کەمیو پوختەیی بخوازێت نەك زۆریو بۆری.

﴿٢١﴾ بەحەقیقەت لە وتارو کرداری پێغەمبەری خوادا ﷺ سەرمەشقییەکی جوان هەیە بۆ ئێوە ، وە بۆ هەر کەسێکیش کە لە ﷲ دەترسیو باوەڕی بە دوارۆژ هەیەو زۆر یادی ﷲ دەکات.

﴿٢٢﴾ جا کاتێك کەباوەڕداران حیزبەکانیان بینی کە هێرشیان بۆ هێناون وتیان: ئەمە ئەو بەڵێنەی ﷲو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ لە سەر تاقیکردنەوەو یارمەتی دانی باوەردارانە و ﷲو پێغەمبەرەکەی ﷺ ڕاستیان فەرموە، جا

مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ﴿٢٣﴾ لِّيَجۡزِيَ ٱللَّهُ ٱلصَّٰدِقِينَ بِصِدۡقِهِمۡ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ إِن شَآءَ أَوۡ يَتُوبَ عَلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٢٤﴾ وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِغَيۡظِهِمۡ لَمۡ يَنَالُواْ خَيۡرٗاۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلۡقِتَالَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزٗا ﴿٢٥﴾ وَأَنزَلَ ٱلَّذِينَ ظَٰهَرُوهُم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ مِن صَيَاصِيهِمۡ وَقَذَفَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعۡبَ فَرِيقٗا تَقۡتُلُونَ وَتَأۡسِرُونَ فَرِيقٗا ﴿٢٦﴾ وَأَوۡرَثَكُمۡ أَرۡضَهُمۡ وَدِيَٰرَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُمۡ وَأَرۡضٗا لَّمۡ تَطَـُٔوهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٗا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيۡنَ أُمَتِّعۡكُنَّ وَأُسَرِّحۡكُنَّ سَرَاحٗا جَمِيلٗا ﴿٢٨﴾ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدۡنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلدَّارَ ٱلۡأٓخِرَةَ فَإِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡمُحۡسِنَٰتِ مِنكُنَّ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿٢٩﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِيِّ مَن يَأۡتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖ يُضَٰعَفۡ لَهَا ٱلۡعَذَابُ ضِعۡفَيۡنِۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٗا ﴿٣٠﴾

ئەم روداوە تەنها باوەڕی زیاد کردن‌و ئەوانیش چاکتر خۆیان دا بە دەست خوداوەو فەرمانەکانی ئەویان بە گەردنکەچیەوە ئەنجام دەدا.

(٢٣) لەناو باوەڕداراندا پیاوانێك بون كە ڕاستیان كرد لەگەڵ ئەو بەڵێنەی كە بە ﷲ یان دابو، جا هەندێكیان مردن یان كوژران لەسەر ئەو بەڵێنەی خۆیان‌و هەندێكی تریان چاوەڕێی ئەو مردنە یان ئەوكوشتنەن‌و لەو پەیمانە كە داویانە بە ﷲ هیچ گۆڕانكارێكی تێدا ناكەن.

(٢٤) تا ﷲ پاداشتی ڕاستگۆیان بداتەوە بەهۆی ڕاستیانەوەو ئەگەر بیەوێت دووڕووەكانیش سزا بدات یان پەشیمان بوونەوەیان لێ وەربگرێت، بەڕاستی ﷲ زۆر چاوپۆشیكەرە لەو كەسەی كە پەشیمان دەبێتەوەو زۆر بەسۆزە بۆی.

(٢٥) خوانەناسان لەگەڵ ئەو هەمو ڕق‌و قینەی كە هەیان بو لە موسڵمانان هیچ سوودێكیان دەست نەكەوت‌و ﷲ ئەوانی سەرشۆڕانە گەڕاندەوە بۆ مەكەو ﷲ خۆی لەجیاتی باوەڕداراندا بە باوو بە فریشتە شەڕی كافرانی لە كۆڵ كردنەوەو ﷲ بە توانایە بۆ ئەنجامدانی هەر كارێك‌و زاڵە بەسەر تەواوی بونەوەردا.

(٢٦) جا ﷲ ئەو زاتەیە كە ئەو كەسانە لە جولەكەو گاور كە بۆ لە ناوبردنی باوەڕداران یارمەتی بت پەرستانی مەكەیان دابو لە قەڵاكانیانی هێنایە خوارەوەو ترسی خستە ناو دڵیانەوەو خۆیان پێ ڕانەگیرا، كە ئێوەش كۆمەڵێكتان لێ كوشتن‌و كۆمەڵێكی ترتان لێ بە دیل گرتن لە خێڵی بەنی قورەیزە.

(٢٧) ئەوسا زەویەكانیان‌و سامانەكانیان‌و ماڵەكانیان‌و ئەو زەویەش كە پێتان لەسەری دانە نابو هەمووی بە ئێوە بەخشی‌و ﷲ بە توانایە بەسەر هەمو شتێكدا.

(٢٨) ئەی پێغەمبەر ﷺ بە خێزانەكانت بڵێ: ئەگەر ئێوە خۆشی ژیان‌و جوانی دنیاتان دەوێت سا وەرن تا مافی خۆتانتان پێ بدەم‌و بە بێ گلەیی‌و ناخۆشی ئازادتان بكەم‌و لەیەك جیا ببینەوە.

(٢٩) خۆ ئەگەر ئێوە ﷲ‌و پێغەمبەرەكەی‌و ژیانی دواڕۆژتان دەوێت دە بمێننەوەو بەم ژیانە ڕازی ببن، جا ﷲ بۆ هەر چاكەكارێكتان پاداشتێكی گەورەی داناوە. ئینجا ڕوو لەهاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ دەكات‌ودەفەرموێ:

(٣٠) ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ هەر كام لە ئێوە تاوانێكی ئاشكرا بكات ئەوە سزای بۆ دوو بەرامبەر دەكرێتەوە، جا ئەوە لەلای ﷲ كارێكی ئاسانە.

(٣١) ئەوسا هەر كام لە ئێوەش گەردنكەچ بێت بۆ فەرمانەكانی ﷲ‌و پێغەمبەرەكەی ﷺ و كرداری چاك ئەنجام بدات پاداشتی چاكەكانی دوو بەرامبەر دەدەینەوە، وە لە بەهەشتدا پاداشتێكی بەڕێزمان بۆ داناوە.

﴿٣٢﴾ ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر ﷺ ئێوە وەکو هیچ ئافرەتێکی تر نین ئەگەر خۆتان بپارێزن، چونکە ئێوە زۆر گەورەن، جا بە خەمزەونازەوە قسە مەکەن لەگەڵ پیاواندا چونکە ئەو کەسەی کە دڵی نخۆشە تەماع دەیگرێتو چاو لە شوێنتان دەبێت، جا بەشێوەیەکی گونجاوو رێك وپێكو بێ خەمزەوناز قسە بکەن.

﴿٣٣﴾ لە ماڵەکانی خۆتاندا ئۆقرە بگرنو دەرمەچن بۆ هیچ لایەكو خۆتان دەرمەخەن وەکو خۆدەرخستنی سەردەمی نەزانی پێشو، ئەوسا نوێژەکانتان بکەنو زەکات بدەنو پەیرەوی اللهو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن، ئەی خاوخێزانی ناو ماڵی پێغەمبەر ﷺ ، اللهدەیەوێت هەمو پیسیەکتان لێ بکاتەوەو لەخووڕەوشتتاندا بە تەواوی پاكو خاوێنتان بکاتەوە.

﴿٣٤﴾ جا بخوێننەوەو باس بکەن ئەوەی کە لە ماڵەکانتدا دەخوێنرێتەوە لە نیشانەکانی الله کە (قورئانە)و لە دانایی کە فەرمودەکانی پێغەمبەرە ﷺ، بێگومان کە الله وردبینو زۆر بەئاگایە.

ئوم سەلەمە دەڵێت وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چیە من هەر پیاوان دەبیستم کە لە قورئاندا باسکراون باسی ئافرەتان نەکراوە؟ جا الله ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێ:

﴿٣٥﴾ بەبێگومان پیاوانی موسڵمانو ژنانی موسڵمانو پیاوانی باوەڕدارو ژنانی باوەڕداو پیاوانی فەرمانبەردارو ژنانی فەرمانبەردارو پیاوانی ڕاستگۆو ژنانی ڕاستگۆو پیاوانی بێ دەعیەو بێ فیزو ژنانی بێ دەعیەو بێ فیزو پیاوانی چاکەکارو ژنانی چاکەکارو پیاوانی ڕۆژوگرو ژنانی ڕۆژوگرو پیاوانێك کە عەیبەی خۆیان لە حەرام دەپارێزنو ژنانێك کە داوێنی خۆیان لە حەرام دەپارێزێنو داوێن پاکنو پیاوانێك کە یادی الله بە زۆری دەکەنو ژنانێك کە یادی الله دەکەن بۆ ئەوانە الله لێخۆشبونو پاداشتی گەورەی بۆ ئامادە کردوون.

وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ﴿٣١﴾ يَٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾ وَٱذْكُرْنَ مَا يُتْلَىٰ فِى بُيُوتِكُنَّ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ وَٱلْحِكْمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ لَطِيفًا خَبِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْقَٰنِتِينَ وَٱلْقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلْخَٰشِعِينَ وَٱلْخَٰشِعَٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾

﴿٣٦﴾ هەر کاتێك اللهو پێغەمبەرەکەی ﷺ بڕیارێك بدەن بۆ هیچ پیاو و ژنێکی باوەڕدار نیە خۆیان بە سەرپشك بزانن، جا هەر کەسێك سەرپێچی لە فەرمانی اللهو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات بەڕاستی هەڵەی کردوە هەڵەیەکی ئاشکرا.

﴿٣٧﴾ جائەو کاتەی کە تۆ وتت بەو کەسەی کە الله بە هۆی ئاشنای کردنی بە دینو بە پێغەمبەرەکەی بەهرەی خۆی بەسەر یا ڕشتبو و پێشتر تۆیش ﷺ بە ئازاد کردنی چاکەت لەگەڵدا کردبو دەتوت: لە خوا بترسەو بە چاکی لەگەڵ هاوسەرەکەتدا ڕەفتار بکەو لەگەڵ یەکتردا بگونجێن، وە ئەوەی ناو دڵی خوتت دەشاردەو خوا هەر دەری دەخات، وە تۆ لە تانەو تەشەری خەڵك دەترسی کەبڵێن: محمد ژنی کوڕەکەی خۆی خواستوە لەکاتێکدا هەر خوا شایستە ترە کە لێی بترسیو ئەوە کوڕی تۆ نیە. جا کە زەید پێویستی خۆی لەو تەواوکردو تەڵاقی دا ئێمە ئەومان (زەینەب) لێت مارە کرد، جا ئەوەمان کرد تا لەسەر باوەڕداران هیچ تاوانێك نەنوسرێت لە مارە کردنی هاوسەرانی ئەوانەی کە بە کوڕی

وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾ وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِىٓ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَٱتَّقِ ٱللَّهَ وَتُخْفِى فِى نَفْسِكَ مَا ٱللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى ٱلنَّاسَ وَٱللَّهُ أَحَقُّ أَن تَخْشَىٰهُ ۖ فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِىِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥ ۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْا۟ مِن قَبْلُ ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ قَدَرًا مَّقْدُورًا ﴿٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يُبَلِّغُونَ رِسَـٰلَـٰتِ ٱللَّهِ وَيَخْشَوْنَهُۥ وَلَا يَخْشَوْنَ أَحَدًا إِلَّا ٱللَّهَ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ حَسِيبًا ﴿٣٩﴾ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا ﴿٤٠﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ ذِكْرًا كَثِيرًا ﴿٤١﴾ وَسَبِّحُوهُ بُكْرَةً وَأَصِيلًا ﴿٤٢﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُصَلِّى عَلَيْكُمْ وَمَلَـٰٓئِكَتُهُۥ لِيُخْرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَـٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَكَانَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ رَحِيمًا ﴿٤٣﴾

خۆیان دادەنا ئەو کاتەی کە تەڵاقیان داو عیددەیان تەواوبو.

ئەوسا فەرمانی ﷲ جێ بەجێ کراوە.

خاتون زەینەب هەمیشە بەم مارەبڕینە خۆی هەڵدەکێشا بەسەر خێزانەکانی ترداو دەیوت ئێوە کەس‌وکارتان مارەی کردون من خوا مارەی کردوم لەپێغەمبەر ﷺ، لەراستیدا ئەمە هەندێك لەپاداشتی پەیڕەوی کردنی بو لە خواو لەپێغەمبەرﷺ لەسەرەتادا، چونکە ئەم پورزای پێغەمبەربو ﷺ، وەیەکێك بو لە خەڵکی ناوداری قورەیش وزەید بەندەیەکی ئازاد کراوبو کە لەو سەردەمەدا لەپلەیەکی زۆر خواردا بو، بەڵام زەینەب‌و خانەوادەکەی لەبەر گوێڕایەڵی بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بەزەید رازی بون‌و بەم شێوەیە لوت بەرزی نێوان خەڵکی ئەو سەردەمەی پێ هەڵوەشاندنەوەو پاشانیش لەگەل یەکدا نەگونجان‌و خوا دایەوە بەپێغەمبەر ﷺ و باوێکی سەخت تر لەباوی پێشوی پێ هەڵوەشاندەوە و تێیگەیاندن کە ژنی بە کوڕکراو وەك ژنی کوڕی خۆی نیەونابێت بەمەحرەمی. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٣٨﴾ لەسەر پێغەمبەرﷺ هیچ خراپەیەك نیە لەبارەی ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە ﷲ بۆی داناوە، ئەمە ڕەوشتی ﷲیە لەناو ئەوانەی کە لە پێشدا ڕەوانەی کردون‌و فەرمانی ﷲ جێ بەجێ کراو دەبێ و هیچ کەس تەنانەت پێغەمبەرانیش بۆیان نیە لە بڕیاری ئەو دەربچن‌و بڕیار هەر بۆ ﷲ یە.

﴿٣٩﴾ ئەو کەسانەی پەیامەکانی ﷲ دەگەیەنن جگە لە ﷲ لە هیچ کەسێکی تر ناترسن، ئەوسا چاودێری‌و پاراستنی ﷲ بەسە بۆ بەندە چاکەکانی.

پێغەمبەری خوا ﷺ چەندین پیلانیان لەدژی سازدا تەنانەت بڕیاری کوشتنیان دا کە دە کوڕی گەنج بەشمشێرەوە شەو هاتنە سەری‌و گەمارۆی ماڵیان دا بەڵام خوا ئەوی بەناویاندا شەو دەرکردو لە ئەشکەوتی سەوردا نەیان بینی‌و لەرێگادا سوراقە نەیتوانی پێی بگات، بەراستی ئەو کەسەی کە خوا بپارێزێت کەس ناتوانێ هیچی لەگەل بکات.

﴿٤٠﴾ محمد ﷺ باوکی هیچکەس لە پیاوانی ئێوە نیە، بەڵام ئەو پێغەمبەری خوایە ﷺ، وە کۆتایی پێغەمبەرانەو هیچ پێغەمبەرێکی تر پاش ئەو نایەت، خوٚ ﷲ بە هەمو شتێك دەزانێ ، واتە: پێغەمبەر ﷺ باوکی زەید نیە وخێزانی زەیدیش بەتەڵاقدانی زەید حەڵاڵە بۆ پێغەمبەر ﷺ. ئەم چەند ئایەتە دەربارەی زەینەبی کچی جەحش‌و زەیدی کوڕی حاریسە دابەزیوە کەوەك وتمان پێشەکی زەینەب‌و کەس‌و کاری لەسەر قسەی پێغەمبەر ﷺ بە زەیدی کوڕی حاریسە کە خزمەتکارو ئازاد کراوی پێغەمبەر ﷺ بو ڕازی بون، جا پاش ماوەیەك لەگەل یەکدا نەگونجان‌وپەروەردگار پێغەمبەری ﷺ ئاگادار کردبو کە ناگونجێن‌و زەینەب هاوسەری تۆ دەبێت، بەڵام پێغەمبەرمان ﷺ هەر ئامۆژگاری هەردووکیانی دەکرد کە لەگەڵ یەکدا بگونجێن، جا دەترسا کە خەڵك بڵێن: محمد ﷺ ژنی کوڕی خۆی خواستووە، چونکە تا ئەو کاتە ئەو جۆرە شێوازی بەکوڕ کردنە باوبوە، خۆ خەڵکیش تا دابەزینی ئەم سورەتە زەیدیان بە زەیدی کوڕی محمد بانگ دەکرد، بەڵام پەروەردگار ئەم بیرو بۆچونانەی بە ناردنی ئەم ئایەتانە پوچەڵ کردووە.ئینجا دەفەرموێ:

﴿٤١﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە یادی اللَّهُ بکەن بەیادکردنێکی زۆر. جا خۆتان بەقسەی بێنرخو لاوەکییەوە خەریك مەکەنوکاتی خۆتان بەهەوانتە لەدەس مەدەن وتراوە "کات لەچاقۆ تیژ ترە گەر نەتبڕی دەتبڕێ".

﴿٤٢﴾ هەمو بەیانیو ئێوارەیەك باس لە پاکیو بێ بێگەردی اللَّهُ بکەن. واتە، تانەو تەشەر لە فەرمانەکانی نەدەن، بێگومان ئەوەی کە خوا دەیزانێ ئێوە نایزانن،

﴿٤٣﴾ اللَّهُ ئەو زاتەیە کە نازو نیعمەتی خۆی دەڕژێنێت بەسەر ئێوەداو لەناو فریشتەکاندا باستان دەکاتو ئەوانیش داوای لێ خۆشبوونتان بۆ دەکەن بۆ ئەوەی لە تاریکاییەکانی خۆپەرستیو ئارەزۆ پەرستیو دنیا پەرستی ڕزگارتان بکاتو بتانخاتە ناو ڕووناکی بیرو باوەڕی پاکەوە، جا ئەو زۆر بە سۆزە بۆ باوەڕداران.

﴿٤٤﴾ بەخێر هێنانیان لەو ڕۆژەی کە دەگەنە پێشگای زاتی حەق سەلام کردنی اللَّهُیە لێیان، ئەوسا پاداشتێکی گەورەو بەڕیزیشی بۆ داناون.

﴿٤٥﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بەڕاستی ئێمە تۆمان ناردوە کە شایەتو مۆژدەدەرو ترسێنەر بیت.

﴿٤٦﴾ جا بە ئیزنی اللَّهُ بانگخواز بیت بۆ ڕێگای ئەو و چرایەکی ڕووناك کەرەوە بیت بۆ خەڵكو ڕێگای ڕاستیان بۆ ڕون بکەیتەوە.

﴿٤٧﴾ جا بە باوەڕداران موژدە بدە کە لەلای اللَّهُ بۆ ئەوان خێرو بەخششێکی گەورە هەیە.

﴿٤٨﴾ ئەوسا تۆ پەیڕەوی خوا نەناسو دووڕووەکان مەکە و گوێ مەدە بەو ئێشو ئازارەی کە بۆت دروست دەکەنو پشت بە اللَّهُ ببەستە، خۆ اللَّهُخۆی بەسە کە پشتیوان بێ.

﴿٤٩﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کاتێك کە ئافرەتانێکی باوەڕدارتان نیکاح کردو پاشان پێش ئەوەی کە بەیەکەوەکۆببنەوە تەڵاقتان دان، ئەوسا بۆتان نیە کە عیددەیان بۆ هەڵژمێرن. واتە: کەسانێکی تر دەتوانن دەست

تَحِيَّتُهُمْ يَوْمَ يَلْقَوْنَهُۥ سَلَٰمٌ ۚ وَأَعَدَّ لَهُمْ أَجْرًا كَرِيمًا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ وَبَشِّرِ ٱلْمُؤْمِنِينَ بِأَنَّ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَضْلًا كَبِيرًا ﴿٤٧﴾ وَلَا تُطِعِ ٱلْكَٰفِرِينَ وَٱلْمُنَٰفِقِينَ وَدَعْ أَذَىٰهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿٤٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا نَكَحْتُمُ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا ۖ فَمَتِّعُوهُنَّ وَسَرِّحُوهُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٤٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ إِنَّآ أَحْلَلْنَا لَكَ أَزْوَٰجَكَ ٱلَّٰتِىٓ ءَاتَيْتَ أُجُورَهُنَّ وَمَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ مِمَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ وَبَنَاتِ عَمِّكَ وَبَنَاتِ عَمَّٰتِكَ وَبَنَاتِ خَالِكَ وَبَنَاتِ خَٰلَٰتِكَ ٱلَّٰتِى هَاجَرْنَ مَعَكَ وَٱمْرَأَةً مُّؤْمِنَةً إِن وَهَبَتْ نَفْسَهَا لِلنَّبِىِّ إِنْ أَرَادَ ٱلنَّبِىُّ أَن يَسْتَنكِحَهَا خَالِصَةً لَّكَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۗ قَدْ عَلِمْنَا مَا فَرَضْنَا عَلَيْهِمْ فِىٓ أَزْوَٰجِهِمْ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُمْ لِكَيْلَا يَكُونَ عَلَيْكَ حَرَجٌ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٠﴾

بەجێ نیکاحیان بکەن، جا با خەڵاتێکیان پێبدەنو بە جوانی دەستیان لێ بەربدەنو ستەمیان لێ نەکەن.

﴿٥٠﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بەڕاستی ئێمە حەڵاڵمان کردوە بۆت ئەو ژنانەی کە مارەییت پێداونو ئەوانەیش کە دەستت کەوتوون لەوەی کە اللَّهُ خستویەتیە دەستت، وە کچانی مامتو کچانی پوری باوکتو کچانی پوری دایکتو کچانی خاڵتو کچانی ئەو پورە دایکیانەت کە لەگەل تۆدا کۆچیان کردووەو ئەو ئافرەتانەی کە ئەگەر خۆی بەخشی بە پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ ویستی نیکاحی بکات کە ئەمەیان تایبەت بە تۆیە نەك بە باوەڕداران، بەڕاستی ئێمە دەزانین بەو فەرمانانەی کە لە سەر باوەڕدارانمان داناون سەبارت بە چەنیەتیو چۆنیەتی هاوسەرانو کەنیزەکانیان بەڵام ئەمانەمان لەسەر تۆ دانەناوە تا بەم شێوەیە ناڕەحەتی لەسەر تۆ نەمێنێت، خۆ اللَّهُ لێبوردەیە لە تاوانی بەندەکانیو زۆربە سۆزە بۆیان.

﴿٥١﴾ جا ئەی محمد ﷺ لە چوونە لای خێزانەکانت سەرپشکیت سەرەی هەر کام لە خێزانەکانت کە ویستت دوای

۞ تُرْجِي مَن تَشَآءُ مِنْهُنَّ وَتُـْٔوِيٓ إِلَيْكَ مَن تَشَآءُ ۖ وَمَنِ ٱبْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن تَقَرَّ أَعْيُنُهُنَّ وَلَا يَحْزَنَّ وَيَرْضَيْنَ بِمَآ ءَاتَيْتَهُنَّ كُلُّهُنَّ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ مَا فِي قُلُوبِكُمْ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَلِيمًا ﴿٥١﴾ لَّا يَحِلُّ لَكَ ٱلنِّسَآءُ مِنۢ بَعْدُ وَلَآ أَن تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَٰجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ إِلَّا مَا مَلَكَتْ يَمِينُكَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ رَّقِيبًا ﴿٥٢﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَدْخُلُوا۟ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيْرَ نَـٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَـٰكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَٱدْخُلُوا۟ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُوا۟ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِۦ مِنكُمْ ۖ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْيِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَـٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا۟ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓا۟ أَزْوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦٓ أَبَدًا ۚ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ إِن تُبْدُوا۟ شَيْـًٔا أَوْ تُخْفُوهُ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٥٤﴾

خە، وە هەر کامیانت ویست بیهێنە لای خۆت، وە کامیانت کە واز لێهێناوە دەتوانیت بیهێنیتەوەو هیچ تاوانێکت لەسەر نیە ئەوە نزیکترە بۆ ئەوەی کە ئەوانە دڵخۆش ببن‌و خەم نەخۆن‌و ڕازی بن بەوەی کە بە هەموویانت داوە، جا بێگومان اللَّهُ دەزانێت بەوەی کە لەناو دڵەکانتاندایە، وە اللَّهُ زۆر زاناو لەسەرخۆیە (بەم ئایەتە پێغەمبەر ﷺ بەشکردنی شەو لەنێوان خێزانەکانیدا لەسەر پێویست نەماو کەوتە دەست خۆی بەڵام ئەو هەر بە شێوەی یەکسانی هاتوچۆی دەکردن تا دڵیان باشتر ڕاگیر بکات‌و ئەوانیش بزانن کە ئەمە پێویست نیە لەسەری، هەر خوایش زانایە.

لەخاتون عائیشەوە (خوا لێی خۆشبێت) هاتووە کەوتی: من پێم ناخۆش بو کە ئافرەت خۆی ببەخشێت بە پێغەمبەر ﷺ و دەم وت: ئایا ئافرەت خۆی دەبەخشێت؟! جا کاتێك اللَّهُ ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ وتم: پەروەردگارت هەر زۆر پەلە دەکات بۆ ئەنجامدانی ئارەزۆکانت/مسلم). ئینجا دەفەرموێ:

(٥٢) پاش ئەم ژنانەی کە هەتن نابێت ژنی تر بهێنیت‌و نابێت ئەو ژنانەی کە هەتن بە ژنی تر بیگۆڕیتەوە ئەگەر چی جوانی ژنانی تر سرنجت بۆ لای خۆیان ڕاکێشێت مەگەر ئەو کەنیزانەی کە بە موڵکی دەستت کەوێت، ئەوسا اللَّهُ بەسەر هەموو شتێکدا چاودێرەو هیچی لێ ون نابێ.

(٥٣) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە مەچنە ماڵەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ مەگەر بۆ خواردن ماوەتان پێبدرێت‌و بۆ ئەو خواردنەیش نەچن هەتا پێدەگات بەڵام هەر کاتێك دەعوەت کران بچنە ژوورەوە، جا هەر کاتێك نانتان خوارد ئەوسا بێنە دەرەوەو دامەنیشن بۆ قسەکردن، چونکە ئەوە دەبێت بە هۆی ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ و ئەویش شەرمتان لێ دەکات کە جوابتان بکات بۆ دەرچون ، بەڵام اللَّهُ شەرم لە فەرمانی ڕاست ناکات کە واتە: بەبێ ڕێگادان نەچنە ژورەوەو وە کە چویشن زیاتر لە پێویست دانەنیشن. جاهەر کاتێك داوای شتێکتان لە خێزانانی پێغەمبەر ﷺ کرد لە پشت پەردەوە داوایان لێ بکەن ئەمە پاکترە بۆ دڵی ئێوەو ئەوانیش، ئەوسا بۆتان نیە ئازاری پێغەمبەری خوا ﷺ بدەن‌و هەرگیز نابێت پاش ئەو خێزانەکانی بخوازن بەڕاستی ئەوە لەلای اللَّهُ تاوانێکی گەورەیە.

(٥٤) ئەگەر هەر شتێك لەو بارەوە بە ئاشکرا بڵێن یان بیشارنەوە چاك بزانن کە اللَّهُ بە هەموو شتێك دەزانێت‌و تۆڵەتان لێ دەسێنێت.

(٥٥) ژنانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ڕووبەڕوو قسەیان کرد لەگەڵ باوکیانداو لەگەڵ کوڕیانداو لەگەل برایانداو لەگەل کوڕانی برایانداو لەگەل کوڕانی خوشکانیانداو لەگەڵ ئافرەتانی موسڵماندا و لەگەڵ کەنیزەکانیاندا هیچ تاوانێکیان لە سەر نیە و پێویستی بە پشتی پەردە نیە، جا لە اللَّهُ بترسن بەبێگومان کە اللَّهُ بە سەر هەموو شتێکدا ئاگادارە.

(٥٦) بەڕاستی اللَّهُو فریشتەکانی سەڵاوات لە پێغەمبەر ﷺ دەدەن، ئەی خاوەنی باوەڕان ئێوەش سەڵاواتی لەسەر بدەن‌و سەلامی لێ بکەن چۆن سەلامێك، وتراوە سەڵاواتی اللَّهُ واتە: سۆزو ڕەزامەندیو سەڵاواتی فریشتە واتە دوعاو داوای

لَّا جُنَاحَ عَلَيۡهِنَّ فِيٓ ءَابَآئِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآئِهِنَّ وَلَآ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ إِخۡوَٰنِهِنَّ وَلَآ أَبۡنَآءِ أَخَوَٰتِهِنَّ وَلَا نِسَآئِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُنَّۗ وَٱتَّقِينَ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ وَمَلَٰٓئِكَتَهُۥ يُصَلُّونَ عَلَى ٱلنَّبِيِّۚ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ صَلُّواْ عَلَيۡهِ وَسَلِّمُواْ تَسۡلِيمًا ﴿٥٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿٥٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُؤۡذُونَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ بِغَيۡرِ مَا ٱكۡتَسَبُواْ فَقَدِ ٱحۡتَمَلُواْ بُهۡتَٰنٗا وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ﴿٥٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ يُدۡنِينَ عَلَيۡهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّۚ ذَٰلِكَ أَدۡنَىٰٓ أَن يُعۡرَفۡنَ فَلَا يُؤۡذَيۡنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿٥٩﴾ ۞ لَّئِن لَّمۡ يَنتَهِ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡمُرۡجِفُونَ فِي ٱلۡمَدِينَةِ لَنُغۡرِيَنَّكَ بِهِمۡ ثُمَّ لَا يُجَاوِرُونَكَ فِيهَآ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٠﴾ مَّلۡعُونِينَۖ أَيۡنَمَا ثُقِفُوٓاْ أُخِذُواْ وَقُتِّلُواْ تَقۡتِيلٗا ﴿٦١﴾ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلٗا ﴿٦٢﴾

لێخۆشبون بۆ کردنیو سەڵاواتی ئوممەتی دیسان دوعا بۆ کردنیو گەورەو ڕێز لێ گرتنی فەرمانەکانیەتی، جا بەڕاستی کەسێك خوا خۆی ڕێزی بۆ دانا بێت پێویستی بە سەڵاواتی ئێمەو تەنانەت فریشتەکانیش نیە بەڵکو ڕێز لێ گرتنو دوعا بۆ کردنی سوودەکەی بۆ خۆمان دەگەڕێتەوە چونکە دەبێت بە مایەی سۆزی اللهو ڕژاندنی رەحمەتی بە سەرماندا، پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ:{ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرًا/ مسلم/ هەر کەس سلاواتێکم لەسەر بدات، الله دە جار ناوی بە چاکە دەبات}.

﴿٥٧﴾ بەڕاستی ئەو کەسانەی کە اللهو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئازار دەدەن لە دنیاو لە دواڕۆژدا بەر نەفرینی الله کەوتونو سزایەکی زەبونکەریان بۆ ئامادە کراوە.

﴿٥٨﴾ جا ئەو کەسانەش کە پیاوانو ژنانی باوەڕدار ئازار دەدەن بە بێ ئەوەی کە تاوانێکیان کردبێت بەڕاستی بارێك بوختانو تاوانی ئاشکرایان لەسەر خۆیان بار کردوە بۆ قیامەتی خۆیان.

﴿٥٩﴾ ئەی پێغەمبەر ﷺ بە ژنانتو کچانتو ژنانی باوەڕداران بڵێ با بە سەرپۆشەکانیان یەخەو سینگیان داپۆشن ئەوە چاکترە بۆ ئەوەی بناسرێنەوە کە پاك داوێنن و ئازار نەدرێن، خۆ الله لێبوردەو بەسۆزە بۆ بەندەکانی، ئەمە دابو نەریتێکی جوانە بۆ خواناسان. ئەوسا سەبارەت بە خراپانیش دەفەرموێ:

﴿٦٠﴾ بەڕاستی دووڕووەکانو ئەوانەی کە لەناو دڵیاندا نخۆشی بێباوەڕی هەیەو ئەوانەش کە دژی موسڵمانان لەناو شاری مەدینەدا پڕوپاگەندە بڵاو دەکەنەوە، ئەوانە ئەگەر واز نەهێنن بەراستی تۆیان لێ هەڵدەنێین کە دژیان بوەستیت، جا زاڵت دەکەین بەسەریاندا پاشان کەمێك لەوان نەبێت لەو شارەدا ناتوانن ببن بە هاوسێت یان پاش ماوەیەکی کەم دەردەکرێن یان دەکوژرێن.

﴿٦١﴾ ئەمانە دەرکراولەرەحمەتی خوا دەبنو لە هەر کوێدا توشبون دەستگیر دەکرێنو دەکوژرێن چۆن کوشتنێك. ئەمە دیمەنی مەدینەیە لە سەرەتای دامەزراندنی حکومەتی ئیسلامەوەو لەولایشەوە سێ تیرەی جولەکەی تێدابو، بەڵام پێغەمبەر ﷺ بە خۆگری خۆیو یارە پەروەردەکراوەکانی پاش ماوەیەکی کەم کردی بە جێگای بتەوی ئەو حکومەتەو هەرچی تێیدابو یەکدەستو یەك قسەو یەك بەرنامە بون، ئەوسا بۆ چەندین سەدەیش پاش پێغەمبەرمان ﷺ هەر بەم شێوەیە مایەوە.

﴿٦٢﴾ ئەمە باوو نەریتی اللهیە لەناو ئەو کەسانەدا کە لە پێش ئەمانەوە بوون، کە بە بۆنەی سەرپێچیو دژایەتی ئایینو پێغەمبەرەکانی خۆیان لەناوبرانو قڕکران، جا ئەمە باوی اللهیە با ئەوانیش بەسەر خۆیاندا بێنەوە کە ئەگەر هەر ئاوا بمێننەوە چارەنوسیان هەروەکو ئەوان دەبێت چونکە سونەتو باوی الله ناگۆڕێت.

يَسۡـَٔلُكَ ٱلنَّاسُ عَنِ ٱلسَّاعَةِۖ قُلۡ إِنَّمَا عِلۡمُهَا عِندَ ٱللَّهِۚ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ تَكُونُ قَرِيبًا ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَعَنَ ٱلۡكَٰفِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمۡ سَعِيرًا ﴿٦٤﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ لَّا يَجِدُونَ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ﴿٦٥﴾ يَوۡمَ تُقَلَّبُ وُجُوهُهُمۡ فِي ٱلنَّارِ يَقُولُونَ يَٰلَيۡتَنَآ أَطَعۡنَا ٱللَّهَ وَأَطَعۡنَا ٱلرَّسُولَا۠ ﴿٦٦﴾ وَقَالُواْ رَبَّنَآ إِنَّآ أَطَعۡنَا سَادَتَنَا وَكُبَرَآءَنَا فَأَضَلُّونَا ٱلسَّبِيلَا۠ ﴿٦٧﴾ رَبَّنَآ ءَاتِهِمۡ ضِعۡفَيۡنِ مِنَ ٱلۡعَذَابِ وَٱلۡعَنۡهُمۡ لَعۡنٗا كَبِيرٗا ﴿٦٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ ءَاذَوۡاْ مُوسَىٰ فَبَرَّأَهُ ٱللَّهُ مِمَّا قَالُواْۚ وَكَانَ عِندَ ٱللَّهِ وَجِيهٗا ﴿٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ إِنَّا عَرَضۡنَا ٱلۡأَمَانَةَ عَلَى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَٱلۡجِبَالِ فَأَبَيۡنَ أَن يَحۡمِلۡنَهَا وَأَشۡفَقۡنَ مِنۡهَا وَحَمَلَهَا ٱلۡإِنسَٰنُۖ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومٗا جَهُولٗا ﴿٧٢﴾ لِّيُعَذِّبَ ٱللَّهُ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ وَيَتُوبَ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمَۢا ﴿٧٣﴾

﴿٦٣﴾ لە بارەی کاتی هاتنی قیامەتەوە پرسیارت لێدەکەن بڵێ زانیاری ئەوە تەنها لە لای اللهیە، وەتۆ نازانیت لەوانەیە ئەو کاتە نزیك بێت.

﴿٦٤﴾ بەبێگومان کە الله نەفرینی لە کافران کردووەو لە دۆزەخیشدا ئاگرێکی بە ئازاری بۆ داناون.

﴿٦٥﴾ کە بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، کە هیچ دۆستو یارمەتیدەرێکیشیان دەست ناکەوێت کە بێت بە دەمیانەوەو یارمەتیان بداتو لەو سزایە رزگاریان بکات.

﴿٦٦﴾ جا ئەوەش لە رۆژێکدایە کە دەمو چاویان لەناو ئاگردا ئەم دیو دیوی پێدەکرێت، دەڵێن: وای بۆ ئێمە خۆزگە بە گوێی فەرمانی اللهو پێغەمبەرەکەیمان ﷺ بکردایە، تا ئێستا لەم سزایە رزگار بوینایە.

﴿٦٧﴾ جاوتیان: ئەی پەروەردگارمان بەڕاستی ئێمە گوێڕایەڵی ئاغاکانو گەورەکانی خۆمان بوین جا ئەوانیش ئێمەیان لە رێگای ڕاست لاداو گومڕایان کردین.

﴿٦٨﴾ جا ئەی پەروەردگارمان لە سزای سەختی دۆزەخ دوو بەرامبەریان پێبدەو لەعنەتیان لێ بکە لەعنەتێکی گەورەو زۆر، خۆ الله سزای هەمویان دوو بەرامبەر دەکات بەڵام ئەوان نەزانن. ﴿كَبِيرًا /بە كثيرًا/زۆر﴾دەخوێنرێتەوە.

﴿٦٩﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە وەکو ئەو کەسانە مەبن کە موسایان ئازار دا، جا الله بەدرۆی خستنەوە لەوەی کەدەیان وت: (موسا بۆیە خۆی ناشۆرێت لەگەڵ ئێمەدا چونکە قۆڕە بەڵام کاتێك لە دووری گەلەکەی پۆشاکی خۆی لەسەر بەردێك داناو خەریکی خۆشۆردن بوو پێیان زانی بە پەلە هاتن تا موسا ببینن، بەڵام بەردەکە ڕای کرد تا گەیشتە ناو خەڵکەکە ئینجا موسا پێیگەیشتو لیباسەکەی پۆشیو بۆیان دەرکەوت کە موسا قۆڕ نیە). بەڵکو ئەو لەلای الله پایە بەرزە.

لە سەحیحی بوخاریدا هاتوە کە:{پێغەمبەر ﷺ جارێك هەندێك شتی دابەشکرد بەسەر کۆمەڵێك لە خەڵکداو پیاوێك وتی: ئەم بەشکردنە مەبەستی خوای تێدا نەبوە، جا پێغەمبەر ﷺ لەمە تووڕە بوو پاشان فەرموی: رحمەتی خوا لە موسا بەڕاستی بە زۆرتر لەمە ئازار درا بەڵام ئەو هەر خۆی گرت} .

﴿٧٠﴾ ئەی ئەوانەی کە باوەڕتان هێناوە لە الله بترسنو قسە بکەن بە قسەیەکی ڕاستودروست.

﴿٧١﴾ کە کردارەکانتان لێ وەردەگرێتو چاوپۆشی لە تاوانەکانتان دەکات، ئەوسا هەر کەسێك گوێڕایەڵی اللهو پێغەمبەرەکەی بێت ﷺ بێگومان خۆشبەخت بووە بە خۆشبەختیەکی گەورە.

﴿٧٢﴾ بەبێگومان خۆمان ئەم ئەمانەتەمان ڕانواند بەسەر ئاسمانەکانو زەویو چیاکاندا (بەڵکو بتوانن شان بدەنە بەری بەڵام ئەوان) خۆیان لادا لێی و ترسان لە هەڵگرتنیو مرۆڤ هەڵیگرت بەڕاستی ئەو بەمکارەی ستەمی لە خۆی کردو نەزان بو بە سەرئەنجامی کارەکەی.

﴿٧٣﴾ تا سەرئەنجام الله سزای پیاوانو ژنانی دووڕوو موشریك بداتو الله تەوبە لە پیاوانو ژنانی باوەڕدار وەربگرێت، خۆ الله زۆر لێبووردەیە لە بەندەکانیو زۆر بەسۆزە بۆیان.

## ٣٤ سورەتی سەبە ٥٤

سورەتی سەبە کە پەنجاو چوار ئایەتە، سورەتی سی‌و چوارەمی قورئانە،لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە جگە لە ئایەتی ﴿ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ ﴾، بەڵام وتویانە مەبەست لەم ئایەتەش ئەهلی کیتاب نیە، بەڵکو مەبەست هاوەڵانی پێغەمبەرن‌و ئەم ئایەتەش هەر مەکەییە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاو هەشتەمەو پاش سورەتی (لقمان)و پێش (الزمر) دابەزیوە. وشەی (سبأ) یەکجار لە سورەتی نەمل‌و یەکجاریش لەم سورەتەدا هاتوە کە ناوی دەوڵەتێکی پێشکەوتوی کۆنە لە وڵاتی یەمەنداو پایەتەختەکەی شاری "سبأ" یان "مَأرِب"بوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆز و بێنهایەت میهرەبان

## ٣٤ سُورَةُ سَبَإٍ ٥٤

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ
الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَهُ الْحَمْدُ فِي الْآخِرَةِ ۚ وَهُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ ﴿١﴾ يَعْلَمُ مَا يَلِجُ فِي الْأَرْضِ وَمَا يَخْرُجُ مِنْهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ السَّمَاءِ وَمَا يَعْرُجُ فِيهَا ۚ وَهُوَ الرَّحِيمُ الْغَفُورُ ﴿٢﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا لَا تَأْتِينَا السَّاعَةُ ۖ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأْتِيَنَّكُمْ عَالِمِ الْغَيْبِ ۖ لَا يَعْزُبُ عَنْهُ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَلَا أَصْغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَا أَكْبَرُ إِلَّا فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ ﴿٣﴾ لِّيَجْزِيَ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ۚ أُولَٰئِكَ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ ﴿٤﴾ وَالَّذِينَ سَعَوْ فِي آيَاتِنَا مُعَاجِزِينَ أُولَٰئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ وَيَرَى الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ الَّذِي أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ الْحَقَّ وَيَهْدِي إِلَىٰ صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ ﴿٦﴾ وَقَالَ الَّذِينَ كَفَرُوا هَلْ نَدُلُّكُمْ عَلَىٰ رَجُلٍ يُنَبِّئُكُمْ إِذَا مُزِّقْتُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّكُمْ لَفِي خَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿٧﴾

﴿١﴾ تەواوی سوپاس بۆ ﷲیە ئەو زاتەی کە ئەوەی لەناو ئاسمانان‌و زەویدایە موڵکی ئەوەو خۆی دروستیکردون‌و هەر بۆ ئەوە سوپاس لە دوارۆژدا هەروەك لە دنیادا وهەر خۆی شایستەی سوپاسە، جا هەر خۆیشێتی کار بەجێ‌و زۆر بەئاگا.

﴿٢﴾ ئەوەی کە دەچێتە ناو زەوی‌و ئەوەش کە لێی دەردەچێت‌و ئەوەی کە لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوەو ئەوەش کە لێیەوە سەردەکەوێت ئەو پێی دەزانێت‌و هەر ئەو خۆیشی بە سۆزە بۆ بەندەکانی‌و چاوپۆشی دەکا لە تاوانەکانیان.

﴿٣﴾ جا ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن وتیان: قیامەت نایەت‌و کاتێ کە مردین زیندو نابینەوە بڵێ: وانیە سوێند بە پەروەردگارم قیامەتتان دێت کەخۆی زانەری تەواوی نهێنیەکانەو بە ئەندازەی گەردیلەیەك‌و بچوکتر لەویش یان گەورەتر لەناو ئاسمانان‌و لەناو زەویدا لەو زاتە ون نابێت، بەڵکو هەموی لەناو پەڕاوی ڕۆشنکەرەوەدایە، بێگومان کەڕۆژی حیساب‌و لێکۆڵینەوە دێت.

﴿٤﴾ تا بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە پاداشتیان بداتەوە، کە ئەوانە لێبوردنیان بۆ هەیەو ڕۆزییەکی زۆرو پاك‌و خاوێنیش.

﴿٥﴾ جا ئەو کەسانەی کە هەوڵیان داوە کە بەڵگەکانی ئێمە هەڵوەشێننەوەو وایان دەزانی کە لە دەست ئێمە ڕزگار دەبن بۆ ئەوانە هەیە سزایەك لە سزای زۆر بەژان.

﴿٦﴾ خۆ ئەوانەی کە زانیاریان پێدراوە چاك دەزانن کە ئەوەی نێردراوە بۆ لای تۆ هەر ئەوە ڕاستەو ڕێنمونی دەکات بۆ ڕێگای زاتی بە دەسەڵاتی سوپاسکراو، واتە: دژایەتیەکەیان تەنها خۆ بەزلزانین‌و لە خۆبایی بوونەو هیچی تر.

﴿٧﴾ جا خوا نەناسان وتیان: ئایا پیاوێکتان بۆ دەست نیشان بکەین کە دەڵێت: هەر کاتێك ئێسقانەکانتان بە تەواوی ڕزی‌و پتورکا بەڕاستی جارێکی تر سەر لەنوێ دەبنەوە وەکو خۆتان؟!

﴿٨﴾ ئایا ئەم کەسە درۆ بەدەم ﷲوە دەکات یان شێتە؟ نەخێر ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە لەو ڕۆژەدا وان لە ناو سزاو گومڕاییەکی زۆر دوور لە ڕاستی، ئینجا پەروەردگار باسی هەندێك لەو شتانە دەکات کە ئاشکراکەری دەسەڵات‌و زانای‌و دانایی ﷲیەو دەفەرموێ:

أَفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا أَم بِهِۦ جِنَّةٌۢ ۗ بَلِ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ فِى ٱلْعَذَابِ وَٱلضَّلَـٰلِ ٱلْبَعِيدِ ﴿٨﴾ أَفَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ إِن نَّشَأْ نَخْسِفْ بِهِمُ ٱلْأَرْضَ أَوْ نُسْقِطْ عَلَيْهِمْ كِسَفًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً لِّكُلِّ عَبْدٍ مُّنِيبٍ ﴿٩﴾ ۞ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ مِنَّا فَضْلًا ۖ يَـٰجِبَالُ أَوِّبِى مَعَهُۥ وَٱلطَّيْرَ ۖ وَأَلَنَّا لَهُ ٱلْحَدِيدَ ﴿١٠﴾ أَنِ ٱعْمَلْ سَـٰبِغَـٰتٍ وَقَدِّرْ فِى ٱلسَّرْدِ ۖ وَٱعْمَلُوا۟ صَـٰلِحًا ۖ إِنِّى بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿١١﴾ وَلِسُلَيْمَـٰنَ ٱلرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ ۖ وَأَسَلْنَا لَهُۥ عَيْنَ ٱلْقِطْرِ ۖ وَمِنَ ٱلْجِنِّ مَن يَعْمَلُ بَيْنَ يَدَيْهِ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَمَن يَزِغْ مِنْهُمْ عَنْ أَمْرِنَا نُذِقْهُ مِنْ عَذَابِ ٱلسَّعِيرِ ﴿١٢﴾ يَعْمَلُونَ لَهُۥ مَا يَشَآءُ مِن مَّحَـٰرِيبَ وَتَمَـٰثِيلَ وَجِفَانٍ كَٱلْجَوَابِ وَقُدُورٍ رَّاسِيَـٰتٍ ۚ ٱعْمَلُوٓا۟ ءَالَ دَاوُۥدَ شُكْرًا ۚ وَقَلِيلٌ مِّنْ عِبَادِىَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ فَلَمَّا قَضَيْنَا عَلَيْهِ ٱلْمَوْتَ مَا دَلَّهُمْ عَلَىٰ مَوْتِهِۦٓ إِلَّا دَآبَّةُ ٱلْأَرْضِ تَأْكُلُ مِنسَأَتَهُۥ ۖ فَلَمَّا خَرَّ تَبَيَّنَتِ ٱلْجِنُّ أَن لَّوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ٱلْغَيْبَ مَا لَبِثُوا۟ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿١٤﴾

﴿٩﴾ئایا تەماشا ناکەن بۆ بەردەمی خۆیان‌و بۆ دوایان کە لە هەمو لایەکەوە ئاسمان‌و زەوی دەبینن ئەگەر ئێمە بمانەوێت بە ناخی زەویدا دەیانبەینە خوارەوە یان پارچەیەك لە ئاسمان دەخەین بە سەریانداو ئەوان هیچ بەرگریەکیان پێ ناکرێت، بێگومان کە لەوەدا نیشانەیەکی گەورە هەیە بۆ هەمو بەندەیەك کە بگەڕێتەوە بۆلای ﷲ.

پاشان پەروەردگار باسی هەندێك لەو نیعمەتانەی خۆی دەکات کە داونی بە داودو پاشان سلێمانی کوڕی‌و دەفەرموێ:

﴿١٠﴾ بەڕاستی لەلایەن خۆمانەوە بەشێکی چاکمان دا بە داود کە وتمان: ئەی چیاکان لەگەڵ ئەودا زیکرەکانی بلێنەوەو باڵندەکانیش، وە ئاسنمان لە دەستی ئەودا نەرم کرد کە بتوانێ بە ئارەزوی خۆی هەرچی مەیل بکات دروستی بکات.

﴿١١﴾ جا بە داوودمان وت: پۆشاکی زرێ دروست بکەو با حەڵقەکانی وەکو یەك بێت تا تیرو شیر نەتوانێت بە ناویدا بڕوات، جا کرداری چاکیش بکە بەڕاستی من بینەری ئەوانەم کە ئێوە دەیکەن.

لە بوخاریدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ شەو گوێی لە قورئان خوێندنی ئەبو موسای ئەشعەری بو، جا پێغەمبەر ﷺ وەستاو گوێی لێ ڕاگرت‌و فەرموی:{لَقَد أُوتِيَ هَذَا مِزمَاراً مِن مَزَامِيرِ آلِ دَاوُد/ بەڕاستی ئەمە ئاوازێکی خۆشی پێدراوە لە ئاوازەکانە بەرەی داود}.

﴿١٢﴾ خۆ بە سلێمانیش بایەکمان دابو کە بەتاقی بەیانی ڕێگای یەك مانگی دەبڕی‌و بەتاقی ئێوارەش ڕێگای یەك مانگ‌و چاوگەی مزیشمان بۆ تواندەوەو هەندێ لە جنۆکەکانیش بە فەرمانی ﷲ لەبەر دەستی سلێمان دا ئیشیان بۆ دەکردو هەر کام لەوان بە سەرپێچی کردن لە بڕیاری سلێمان فەرمانی ئێمەیان بشکاندایە ئێمە سزای ئاگرمان پێ دەچەژاند

﴿١٣﴾ جا هەرچی بویستایە لە کۆشك‌و تەلاری بەرزو پەیکەرەکان‌و حەوزی گەورەی ئاوو مەنجەڵی گەورەو گران بۆیان دروست دەکرد. دیارە کە لە ئاینی ئەودا دروستکردنی پەیکەری گیان لەبەران حەرام نەبوە، یان وتراوە کە ئەوانە پەیکەری گیان لەبەران نەبوون. جا وتمان: ئەی خێڵ‌و بنەماڵەی داود سوپاسگوزاربن کە بەڕاستی کەمێك لە بەندەکانم سوپاسگوزارن؟!

﴿١٤﴾ جا ئەو کاتەی کە بڕیاری مردنی سلێمانمان دا هیچ کەس بە مردنەکەی نەزانی. وتراوە کە سلێمان خۆی دابو بەسەر عەساکەیدا جا لەو کاتەدا گیانی دەرچوو بو هەر بەو شێوەیشە مابووە تا جنۆکەکانی ئەو کارەی کە پێی سپاردبوون تەواویان کرد، ئینجا خۆرکە لەبنەوە عەساکەی خواردو کەوت ئینجا زانیان کە سلێمان مردوە، جا کاتێك کەوت ئیتر جنۆکەکان زانیان کە ئەوان نهێنی نازانن چونکە ئەگەر ئەوان نهێنیان بزانیایەو لە مردنی سلێمان ئاگایان ببووایە لەو سزا گاڵتە پێکەرەدا نەدەمانەوە بەڵکو زووتر بڵاوەیان لێدەکردو ئەو کارەقورسانەیان نەدەکرد، بەم شێوەیە پەروەردگار هەم جنۆکەو هەم مرۆڤی تێگەیاند کە کەستان نهێنیەکان نازانن. ئینجا پەروەردگار بەسەرهاتی گەلێکی خاوەن جێگاو باغو بێستانی زۆرو خۆش بەڵام

لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَاهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ ﴿١٧﴾ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ الْقُرَى الَّتِي بَارَكْنَا فِيهَا قُرًى ظَاهِرَةً وَقَدَّرْنَا فِيهَا السَّيْرَ سِيرُوا فِيهَا لَيَالِيَ وَأَيَّامًا آمِنِينَ ﴿١٨﴾ فَقَالُوا رَبَّنَا بَاعِدْ بَيْنَ أَسْفَارِنَا وَظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ فَجَعَلْنَاهُمْ أَحَادِيثَ وَمَزَّقْنَاهُمْ كُلَّ مُمَزَّقٍ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ ﴿١٩﴾ وَلَقَدْ صَدَّقَ عَلَيْهِمْ إِبْلِيسُ ظَنَّهُ فَاتَّبَعُوهُ إِلَّا فَرِيقًا مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٠﴾ وَمَا كَانَ لَهُ عَلَيْهِم مِّن سُلْطَانٍ إِلَّا لِنَعْلَمَ مَن يُؤْمِنُ بِالْآخِرَةِ مِمَّنْ هُوَ مِنْهَا فِي شَكٍّ وَرَبُّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ حَفِيظٌ ﴿٢١﴾ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ اللَّهِ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِي السَّمَاوَاتِ وَلَا فِي الْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾

ناسوپاس بەناو (سەبەء)کە لە یەمەن دا نیشتەجێبون باسدەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٥﴾ بەڕاستی لە بەسەرهاتی جێگاو ڕێگای (سەبەء)دا نمونەیەکی گرنگ هەیە لەسەر دەسەڵاتو هێزی ﷲ. لەلای ڕاستو چەپی ئەو شیوەی ئەوانەوە دوو باخچەی چڕو پڕو بەروبوومدار بو. جا پێیان وترا: لە ڕۆزی پەروەردگارتان بخۆنو سوپاسی بکەن، جا بەم شێوەیە شارێکی پاکو پەروەردگارێکی لێبوردە.

﴿١٦﴾ کەچی ئەوان پشتیان لە خواناسیو سوپاسکردنی کرد، جا ئێمەش لافاوێکی داپلۆسێنەرمان بۆ ناردن کە زەویو باغو بێستانی ڕامالێنو لەجیاتی ئەو دوو باخچە بەنرخەیان دوو باخچەمان پێدان کە خاوەنی میوەی تاڵو گەزەچارو بەشێکی کەم لە سیدر بو.

﴿١٧﴾ ئا ئەوە تۆڵەی ئێمە بو کە لێمان سەندن، چونکە زۆر ناشوکربون، ئایا ئێمە سزای ئاوا بە بێجگە لە ناسوپاسان دەچەژێنین؟

﴿١٨﴾ جا لە نێوان ئەوانو ئەو وڵاتەی شام کە خەیرو پیتمان تێخستبو شارو و دێهاتی فرەوانو یەك بەدوایی یەکمان دانا بو، جا جێگای هاتوچۆو شوێنی حەوانەوەمان بۆ دیاری کرد بون کە ئەگەر لە شارێکدا بە ڕۆژ بحەسانایەوە لە یەکێکی تر شەویان دەکردەوە تا دەچوونو دەهاتنەوە کە پێمان وتن: بە شەوانو بە ڕۆژان بە ناویاندا بەبێ ترس بێنوبچن. جا لەباتی سوپاسی ﷲو شادمان بونیان بەو بارو دۆخەچاکەی کەبۆی ڕەخساندبون ناشوکریان کردو بێمنەت بون.

﴿١٩﴾ ئەوسا وتیان: ئەی پەروەردگارمان ئەم دێهاتو شارە لە یەك نزیکانەی سەر ڕێگامان لەناو ببەو جێگای حەسانەوەمان دوور بخەرەوە ـ تا فەقیرو هەژار کە وشترو هۆکاری ئازوگویازی چاکیان نیە، نەتوانن بۆ کاسبیو کار هاتوچۆ بکەن، ئەم دەوڵەمەندو سەرمایەدارانە ویستیان بەم شێوەیە خۆیان لە فەقیرو کەم دەرامەت جیابکەنەوەو سوودێکی زیاتریان دەست بکەوێت، جا داواکانیان زوو وەرگیراو دێهاتو شارە نزیکەکانی سەر ڕێگا لەناوچون، جا بەم ڕەفتارو وتارە نابەجێیو سپەڵەیانەیان ـ ستەمیان لە خۆیان کرد، ئەوسا ئێمەش وا پەرتو بڵاومان کردنەوە کە بون بە داستانو چیرۆکی دەمی خەڵكو بە تەواوی پارچە پارچەمان کردن، بەڕاستی لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ هەمو خۆگرێکی سوپاسگوزار. بەڵێ لە ڕاستیدا ئەمە فیتی شەیتان بو کە ئەوان ئاوا سەریان لێشێواو کردبونی بە مرۆڤێکی سپڵەو ناشوکر، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٢٠﴾ بەڕاستی شەیتان گومانەکەی خۆی کە هەڵخەڵەتاندنی ئەو خەڵکە بو هێنایە دیو فریوی دانو ئەوانیش پەیڕەوییان لێ کرد بێجگە لە کەمێك لە باوەڕداران.

﴿٢١﴾ خۆ شەیتانیش هیچ توانایەکی بەسەر ئەواندا نەبو بەڵکو ئێمە ماوەمان پێدا تا دەرکەوێت بۆمان کە چ کەسێك باوەڕی بە دواڕۆژ دەهێنێتو چ کەسێکیش لەبارەی ئەو ڕۆژەوە لە گوماندایە، ئەمە تەنها بۆ خۆیانە تا لە دواڕۆژدا هەر کەس بەوەی کە کردویەتی لێپرسینەوەی لەگەڵدا بکرێتو خۆیشی نەتوانێت نکولی لێ بکات ئەگینا ﷲ پێش دروستکردنمان سەر ئەنجامی زانیوین وەکو دەفەرموێ: خۆ پەروەردگارت بەسەر هەمو شتێکدا چاودێرەو ئەو توانای هەیە کە ماوە بە شەیتان نەدات بەڵام دنیا بۆ تاقیکردنەوەیەو پێویستە هۆیەکانی تاقیکردنەوە هەبێت. جا لەپاش باسکردنی بەسەرهاتی ئەم قەومانە دەفەرموێ:

﴿٢٢﴾ ئەی محمد بە موشریکان بڵێ: بانگ بکەنە ئەو کەسانەی کە بێجگە لە ﷲ دەیانپەرستن بابێن بە هاوارتانەوە کە بەڕاستی ئەوانە لەم بونەوەردا خاوەنی ئەندازەی گەردیلەیەکیش نین لە ناو ئاسمانانو نەلەناوزەویدا، جا لە ناویاندا هیچ هابەشو

وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَـٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا فُزِّعَ عَن قُلُوبِهِمْ قَالُوا۟ مَاذَا قَالَ رَبُّكُمْ ۖ قَالُوا۟ ٱلْحَقَّ ۖ وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٢٣﴾ ۞ قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ ۖ وَإِنَّآ أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَىٰ هُدًى أَوْ فِى ضَلَـٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ قُل لَّا تُسْـَٔلُونَ عَمَّآ أَجْرَمْنَا وَلَا نُسْـَٔلُ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٥﴾ قُلْ يَجْمَعُ بَيْنَنَا رَبُّنَا ثُمَّ يَفْتَحُ بَيْنَنَا بِٱلْحَقِّ وَهُوَ ٱلْفَتَّاحُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٢٦﴾ قُلْ أَرُونِىَ ٱلَّذِينَ أَلْحَقْتُم بِهِۦ شُرَكَآءَ ۖ كَلَّا ۚ بَلْ هُوَ ٱللَّهُ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢٧﴾ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٨﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَـٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ قُل لَّكُم مِّيعَادُ يَوْمٍ لَّا تَسْتَـْٔخِرُونَ عَنْهُ سَاعَةً وَلَا تَسْتَقْدِمُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ بِهَـٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ ۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّـٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ﴿٣١﴾

شەریکێکی خوایان نیە، خۆ بۆ ﷲ یش لە ناو ئەوان دا هیچ وەزیرو یارمەتیدەرێك نیە كە یارمەتی بدات نە لە دروستكردنداو نە لە بەڕێوەبردنی كاروباری بونەوەردا. كەوابو ئەی نەفامان ئەو خوا بێ كەڵكانەتان چۆن دەتوانن بێن بەهاوارتانەوە كە خاوەنی خۆیشیان نین؟!

﴿٢٣﴾ هیچ تكا كردنێك لەلای ئەو سوودی نیە مەگەر بۆ كەسێك كە ﷲ ماوەی پێدابێت، واتە: نە تكا كارێك دەتوانێت تكا بۆ كەس بكاتو نە تكا بۆكراوێك تكای بۆ دەكرێت هەتا ﷲ ماوەیان پێنەدات، جا لەو كاتەی كە شەفاعەت ڕێگای پێدرواو ترس لەسەر دڵیان لاچوو هەندێكیان دەڵێن: پەروەردگارتان چی وت؟ هەندێكی تریان وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن: ڕاستی وتو بەڵێنەكەی هاتەدیو هەر خۆیەتی بڵند مەقامو گەورە.

جا ئەوانەی كە موشریكان دەیانپەرستن خاوەنی هیچ سوودو زیانێك نین و لە گەڵ ئەو زاتەی كە خاوەنی هەمو سوودو زیانێكە هاوبەش نینو ئەو زاتەیش هیچی بەئەوان نەسپاردوەو تكا كردنیش بە بێ ویستی ئەو ناكرێت، كەوابو بۆ دەبێت لە بێجگە لەو زاتە بترسینو چاوەڕێی سوود یان زیان بكەین؟!

﴿٢٤﴾ بڵێ: لە ئاسمانانو لە زەویدا كێ ڕۆزیتان پێدەدات؟ بڵێ: هەر ﷲ یە ڕۆزیتان پێدەدات. جا بێگومان یەكێكمان، من یان ئێوە لەسەر ڕێگای ڕاستەو ئەویتر لەناو گومرایی ئاشكرادایە؟ ئەمە قسەی كەسێكە كە لە ڕاستیو دروستی ڕێگای خۆی دڵنیایە، بەڵام بۆ ئەوەی كە بیانكێشێت بۆناو باسو لێكۆڵینەوە بەم شێوە نەرمە لە گەڵیاندا دەدوێت، لە ڕاستیدا ئەمە وانەیەكی گرنگە بۆ بانگەوازكاران.

﴿٢٥﴾ بڵێ: لەبارەی ئەو تاوانانەی كە ئێمە دەیكەین پرسیار لە ئێوە ناكرێتو لە ئێمەش ناپرسنەوە لەبارەی ئەوەی كە ئێوە دەیكەنو هەركەس باری خۆی هەڵدەگرێت. تەماشای میهرەبانی بانگەوازكەرانی ڕاستەقینە بكە كە بۆ خۆیان وشەی تاوان دەڵێت بۆ ئەوان كردار دەڵێت ئاوایە بانگەوازی حەكیمانە كە لەم سورەتە مەكەییانەدا هاتوە، ئای خۆزگە بانگەوازكارانی ئیسلامی ئەم سەردەمەیش دەگەڕانەوە بەخۆیانداو پلەو پایەی خۆیانو پەیامەكەیانو بەندەكانی ﷲ یان بزانیایەو بۆ هەر كامێكیان مافی خۆیان پێبدایەو بانگەوازیان بۆ لای ﷲ بووایە نەك بۆ لای پارتو حیزبو خۆپەرستیودنیاپەرستی؛

﴿٢٦﴾ بڵێ: پەروەردگارمان لە ڕۆژی قیامەتدا كۆمان دەكاتەو پاشان بەڕاستی لە نێوانماندا بڕیار دەدات، چاكان بۆ بەهەشتو خراپان بۆ ئاگر، جا هەر خۆیەتی بڕیاردەرو زانەر بەڕاستیو دروستی هەمو شتێك.

﴿٢٧﴾ بڵێ: پیشانم بدەن ئەوانەی كە كردوتانن بە هاوبەشی ﷲ، كوانو لەكوێن؟ كەلە ڕاستیدا هیچ هاوبەشێكی نیە بەڵكو ئەو پەروەردگاری بە تواناو كار بەجێیە.

﴿٢٨﴾ خۆ تۆمان ڕەوانە نەكردوە مەگەر بۆ هەمو خەڵك بەبێ جیاوازی زمانو نەژادو ڕەنگ كە مۆژدەدەر بیت بە بەهەشتو پاداشتیو هەرگیز دوانەهاتو بۆ چاكانو ترسێنەری بیت بە دۆزەخو سزای سەختو بە ژانو هەرگیز نەبڕاوە بۆ خراپانی خوانەناس. بەڵام زۆربەی خەڵك ئەمە نازاننو خۆیانی لێ لادەدەن.

﴿٢٩﴾ جا دەڵێن: كەی ئەم بەڵێنە دێتە جێ ئەگەر ڕاست دەكەن. واتە: لە باتی پەشیمان بوونەوەو داوای لێبوردن گاڵتە بە هاتنی ئەو ڕۆژە دەكەنو بەپەلەن بۆی؟! جا پەروەردگاریش دەفەرموێ:

﴿٣٠﴾ پێیان بڵێ: بۆ ئێوە ڕۆژێكی دیاریكراو هەیە كە ئەگەر ئەو ڕۆژە هات ئیتر ئەگەر داواش بكەن تاوێك لەو ڕۆژە نە دوا دەكەونو نە پێشیش دەكەون

﴿٣١﴾ ئەو خوانەناسانە وتیان: نە باوەڕ بەم قورئانە دەكەینو نە باوەڕ بەوانەی پێش ئەویش. كە هەمویان بەڵگەن لەسەر زیندوبوونەوەو حەشرو حیساب، جا خوای گەورە دەفەرموێ: ئەگەر تۆ دەت بینی كە ئەم ستەمكارانە لە بەرامبەر

پەروەردگاری خۆیانەوە چۆن وەستێنراون کە هەندێکیان لە دەمی هەندێکیان دەدەنەوەو ئەوانەی کە شوێنکەوتون بەوانەی کە لوت بەرزو ئاغایان بون دەڵێن: ئەگەر هەڵەی ئێوە نەبووایە ئێمە باوەڕمان دەهێناو ئەمڕۆ ئاوا گرفتار نەدەبوین.

﴿٣٢﴾ لوتبەرزان بەوانەی کە ژێردەستە بوون دەڵێن: ئایا ئێمە بوین کە ئێوەمان بە زۆر لە ڕێگای ڕاست لادا پاش ئەوەی کە پێغەمبەرتان هاتە لا؟ نەخێر، ئێوە خۆتان تاوانبارن‌و ستەمتان لە خۆتان کردوە.

﴿٣٣﴾ جا ژێردەستانیش بە لوت بەرزانیان دەڵێن: نەخێر وانیە کە ئێوە دەڵێن بەڵکو شەوو ڕۆژتان لەئێمە حەرامکردو بە فاتو فیتو وازتان لە ئێمە نەهێناو ئێمەتان هەڵخەڵەتاندو لە ڕێگای ڕاست لاتان داین ئەو کاتەی کە فەرمانتان پێکردین کە بە ﷲ باوەڕ نەکەین و هاوبەشانێکیشی بۆ دابنێین، جا ئەو کاتەی کە سزایان بینی بەم شێوەیە پەشیمانی خۆیان دەردبڕن.خۆ ئێمە زنجیر دەکەینە ملی ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن، ئایا تۆڵەمان لێ سەندن بێجگە لەسەر ئەو کردارانەی کە لە دنیادا کردویانە؟ واتە: هەر کەس سزای هەر ئەوە دەچەژێت کە کردویەتی وستەمی لێ ناکرێت.

﴿٣٤﴾ هیچ پێغەمبەرێکی ترسێنەرمان ڕەوانە نەکردوە بۆ هیچ گەلێك مەگر سەرمایەدارو ئاغاکانیان بەو پێغەمبەرانەیان وتووە: ئێمە بە ئەوەی کە ئێوە بۆی ڕەوانەکراون بێباوەڕین. جا حاڵی ئەوانەی کە ئەمڕۆ باوەر بەتۆ ناهێنن هەر وەك ئەوان وایەو ئەنجامیشیان هەر وەك ئەوان دەبێت.

﴿٣٥﴾ جا وتیان: ئێمە سەروەت‌و سامان‌و منداڵی زۆرترمان هەیەو ئێمە سزا نادرێین. چونکە وادەزانن ئەگەر لەلای ﷲ خۆشەویست نەبونایە ئەوانەیان پێنەدەدرا.

﴿٣٦﴾ بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم بە لێشاوی ڕۆزی دەدات بە کەسێك کە خۆی مەیلی لێ بێت‌و هەر وەهایش دەیگرێتەوە لەکەسێك کە خۆی مەیلی لێ بێ، بەڵام زۆربەی خەڵك ئەو ڕاستیە نازانن.

﴿٣٧﴾ پێویستە ئەوەش بزانن کە نەسەروەت‌و سامانتان‌و نە منداڵانتان نابن بەهۆی ئەوەی کە لە ئێمەوە نزیکتان کەنەوە بەڵام ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێنا بێت‌و کرداری چاکیان کرد بێت ئەوانە لە ئێمەوە نزیکن، جا ئەوانە بە هۆی ئەو کردارانەی کە کردوویانە پاداشتی چەند بەرامبەریان بۆ هەیە، خۆ ئەوان

قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ بَلۡ مَكۡرُ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ إِذۡ تَأۡمُرُونَنَآ أَن نَّكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَنَجۡعَلَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ وَأَسَرُّواْ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ وَجَعَلۡنَا ٱلۡأَغۡلَٰلَ فِيٓ أَعۡنَاقِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ هَلۡ يُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٣٣﴾ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٤﴾ وَقَالُواْ نَحۡنُ أَكۡثَرُ أَمۡوَٰلٗا وَأَوۡلَٰدٗا وَمَا نَحۡنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٣٥﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُم بِٱلَّتِي تُقَرِّبُكُمۡ عِندَنَا زُلۡفَىٰٓ إِلَّا مَنۡ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ جَزَآءُ ٱلضِّعۡفِ بِمَا عَمِلُواْ وَهُمۡ فِي ٱلۡغُرُفَٰتِ ءَامِنُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يَسۡعَوۡنَ فِيٓ ءَايَٰتِنَا مُعَٰجِزِينَ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡعَذَابِ مُحۡضَرُونَ ﴿٣٨﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦ وَيَقۡدِرُ لَهُۥۚ وَمَآ أَنفَقۡتُم مِّن شَيۡءٖ فَهُوَ يُخۡلِفُهُۥۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿٣٩﴾

لەناو هۆدەکانی ناو کۆشکەکانیان لە بەهەشتدا بێترسانە ژیان بە خۆشیەکی بەردەوامەوە دەبەنە سەر.

﴿٣٨﴾ جا ئەوانەی کە بۆ دژایەتی نیشانەکانی ئێمەو ناشیرین کردنیان هەوڵ دەدەن ناتوانن لە دەست ئێمە دەربچن، ئەوانە هەمویان لەناو سزای دۆزەخ دا ئامادە دەکرێن.

﴿٣٩﴾ بڵێ: بەڕاستی پەروەردگارم بە لێشاوی ڕۆزی دەدات بەو کەسانەی کە ئارەزۆی لێ بێت لە بەندەکانی‌و دەیگرێتەوە لێیشی، جا ئەوەی کە دەیبەخشن هەر شتێك هەبێت بەڕاستی پەروەردگار جێگای پڕ دەکاتەوە، وەئەو چاکترینی ڕۆزیدەرانە. پیغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلَّا مَلَكَانِ يَنْزِلَانِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا وَيَقُولُ الْآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا /متفق علیە/ هیچ ڕۆژێك لەبەندەکان نابێتەوە مەگەر دوو فریشتە دادەبەزن جا یەکێکیان دەڵێ: ئەی ﷲ ببەخشە بەوەی کە دەبەخشێت،وە ئەوی تریان دەڵێ: ئەی ﷲ بگرەوە لەوەی کە دەگرێتەوەو نابەخشێت}.

وَيَوۡمَ يَحۡشُرُهُمۡ جَمِيعٗا ثُمَّ يَقُولُ لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَهَٰٓؤُلَآءِ إِيَّاكُمۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٤٠﴾ قَالُواْ سُبۡحَٰنَكَ أَنتَ وَلِيُّنَا مِن دُونِهِمۖ بَلۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ ﴿٤١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا يَمۡلِكُ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٖ نَّفۡعٗا وَلَا ضَرّٗا وَنَقُولُ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلنَّارِ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٖ قَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّا رَجُلٞ يُرِيدُ أَن يَصُدَّكُمۡ عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُكُمۡ وَقَالُواْ مَا هَٰذَآ إِلَّآ إِفۡكٞ مُّفۡتَرٗىۚ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴿٤٣﴾ وَمَآ ءَاتَيۡنَٰهُم مِّن كُتُبٖ يَدۡرُسُونَهَاۖ وَمَآ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ قَبۡلَكَ مِن نَّذِيرٖ ﴿٤٤﴾ وَكَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ وَمَا بَلَغُواْ مِعۡشَارَ مَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ فَكَذَّبُواْ رُسُلِيۖ فَكَيۡفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٤٥﴾ ۞ قُلۡ إِنَّمَآ أَعِظُكُم بِوَٰحِدَةٍۖ أَن تَقُومُواْ لِلَّهِ مَثۡنَىٰ وَفُرَٰدَىٰ ثُمَّ تَتَفَكَّرُواْۚ مَا بِصَاحِبِكُم مِّن جِنَّةٍۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا نَذِيرٞ لَّكُم بَيۡنَ يَدَيۡ عَذَابٖ شَدِيدٖ ﴿٤٦﴾ قُلۡ مَا سَأَلۡتُكُم مِّنۡ أَجۡرٖ فَهُوَ لَكُمۡۖ إِنۡ أَجۡرِيَ إِلَّا عَلَى ٱللَّهِۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٞ ﴿٤٧﴾ قُلۡ إِنَّ رَبِّي يَقۡذِفُ بِٱلۡحَقِّ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴿٤٨﴾

﴿٤٠﴾ وه له‌و ڕۆژه‌دا هه‌مو موشریكان كۆ ده‌كاته‌وه ئینجا به فریشته‌كان ده‌فه‌رموێ: ئایا ئه‌مانه به‌ندایه‌تی ئێوه‌یان كردوه؟ وه ئێوه پێتان وتوون كه ئاوا بكه‌ن.

﴿٤١﴾ ئه‌وانیش وتیان: پاك‌و بێ عه‌یبی هه‌ر بۆ تۆیه‌و هیچ هاوه‌ڵێكت نیه، تۆ دۆستی ئێمه‌یت نه ئه‌وان به‌ڵكو ئه‌وانه جنۆكه‌یان ده‌په‌رست‌و په‌یڕه‌ویان له‌وان ده‌كردو زۆربه‌یان باوه‌ڕیان به‌وان بو.

﴿٤٢﴾ جا په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموێ: ده‌ی بزانن كه ئه‌مڕۆ هیچكام له ئێوه بۆ ئه‌وی ترتان خاوه‌نی هیچ سوودو زیانێك نیه، جا به‌و كه‌سانه‌ی كه سته‌میان كردوه ده‌ڵێین: بچه‌ژن سزای ئه‌و ئاگره‌ی كه ئێوه باوه‌ڕتان پێی نه‌بو. جا با ئیستا هه‌ر هاوار بكه‌ن‌و بڵێن كه ئه‌مه ڕاست نیه، وه‌ئه‌مه ئاگر نیه‌و ناسوتێین!

﴿٤٣﴾ هه‌ر كاتێك كه نیشانه ڕۆشنكه‌ره‌وه‌كانی ئێمه‌یان به سه‌ردا بخوێنرێته‌وه ده‌ڵێن: ئه‌وه هه‌ر پیاوێكه‌و ده‌یه‌وێت ئێوه به‌رگری بكات له په‌رستنی ئه‌وه‌ی كه باو باپیرانتان په‌رستوویانه. جا ده‌ڵێن: ئه‌وه هه‌ر درۆیه‌كه كه هه‌ڵبه‌ستراوه‌و هیچ بنه‌مایه‌كی ڕاستی نیه، خوا نه ناسانیش به‌و په‌یامه ڕاسته كه كاتێك هاته لایان ده‌ڵێن: ئه‌مه جگه له سیحرو جادوویه‌كی ئاشكرا شتێكی تر نیه.

﴿٤٤﴾ به ئه‌وانه‌ی كه وا ده‌ڵێن هیچ په‌ڕاوێكمان نه‌دابو كه بیخوێننه‌وه‌و پێش تۆوهیچ پێغه‌مبه‌رێكیشمان بۆ نه‌ناردون كه‌بیانترسێنێ. جا ئیتر له سه‌ره چ بنه‌مایه‌كی زانستی ده‌زانن كه تۆ ڕاست ناكه‌یت‌و به‌ڵگه‌یان جگه له‌نه‌فامی چی تره؟

﴿٤٥﴾ خۆ ئه‌و كه‌سانه‌ی كه له‌پێش ئه‌وانه‌وه بوون هه‌روه‌كو ئه‌مانه‌ی سه‌رده‌می تۆ بێباوه‌ڕبون به پێغه‌مبه‌ره‌كانیان له حاڵێكدا كه‌ده‌یه‌كی ئه‌و شتانه‌ی كه به ئه‌وا نمان دابو له هێزو سه‌روه‌ت‌و سامان‌و ته‌مه‌ن درێژی به‌م كافرانه‌ی ئه‌م سه‌رده‌مه‌مان نه‌داوه، جا كه ئه‌وان كاتی خۆی باوه‌ڕیان به پێغه‌مبه‌رانی ئێمه نه‌كردو به درۆیان خستنه‌وه له ناومان بردن، سا بزانه تۆڵه‌و سزای ئێمه بۆ ئه‌وان ده بێ چۆن بووبێت؟ جا په‌ندو ئامۆژگاری وه‌رگرن‌و لاسایی ئه‌وان مه‌كه‌نه‌وه با دوچاری سزایه‌كی وه‌كو سزای ئه‌وان نه‌بن، ئه‌مه‌ش یه‌كێكه له میهره‌بانی په‌روه‌ردگار كه چه‌ند به جوانی ئامۆژگاری به‌نده‌كانی ده‌كات‌و چه‌ند به په‌رۆشه‌وه‌یه بۆیان.

﴿٤٦﴾ بڵێ: من ئامۆژگاریتان هه‌ر به یه‌ك شت ده‌كه‌م ئه‌ویش ئه‌وه‌یه كه له‌به‌ر زاتی ﷲ بۆ په‌یڕه‌وی كردنی ڕاستی‌و گه‌یاندنی په‌یامی ﷲ به‌دوودوو به تاك تاك راپه‌ڕن، پاشان ئه‌ی بت په‌ره‌ستان بیربكه‌نه‌وه له‌و په‌یامه‌و له‌و پێغه‌مبه‌ره. كه ئه‌و ڕه‌فیقه‌تان هیچ جۆره شێتیه‌كی پێوه نیه‌و به چاكیش ئه‌مه ده‌زانن جا ئه‌و قسه پڕو پوچانه‌تان له‌چییه؟ ئه‌و ته‌نها ترسێنه‌رێكه بۆ ئێوه پێش ئه‌وه‌ی بگه‌ن به سزای سه‌ختی قیامه‌ت.

﴿٤٧﴾ بڵێ: من له‌سه‌ر گه‌یاندنی ئه‌م په‌یامه به ئێوه داوای هه‌ر چیتان لێ بكه‌م ته‌نها بۆ سوودو خۆش به‌ختی خۆتانه، هیچ پاداشتێكم له ئێوه ناوێت پاداشتی من هه‌ر له‌لای ﷲیه‌و ئه‌و خۆی به‌سه‌ر هه‌مو شتێكدا ئاگاداره‌و ده‌زانێت كه من ڕاست ده‌كه‌م‌و ئێوه چۆنم له‌گه‌ڵدا ده‌كه‌ن‌و پاداشتیشم چه‌نده؟

﴿٤٨﴾ بڵێ: بێگومان په‌روه‌ردگار به حه‌ق‌و ڕاستی به‌تاڵ ته‌فروتونا ده‌كات، هه‌ر ئه‌ویشه كه زۆر چاك زانه‌ری ته‌واوی شاراوه‌كانه.

(٤٩) بلێ: ئەوە پەیامی حەقو ڕاستی هات کە ئیسلامەو تازە بێباوەڕی دەست پێ ناکاتەوەو جارێکی تریش ناگەڕێتەوە. لە ڕاستیدا ئەگەرچی کوفر زۆرەو پەرەی سەندوە بەڵام تازە ئەو هێزو توانایەی پێش ئیسلامی نیە چونکە لە هەمو جێگایەك بەشێکی زۆر لە خەڵك موسڵمانەو کەمو زۆر پارێزگاری لەو ئایینە دەکەنو دوژمن تازە ناتوانێت گەمارۆی ئیسلام بدات بەناوی ئیسلامەوە، ئەوەتا ئەمڕۆ چەندین ناوی جۆراو جۆر دادەنێن بۆ موسڵمانان تا بەوە دوو نیشانە بپێکن:

**یەکەم:** لەرواڵەتا بڵێن ئێمە دژی ئایینی ئیسلام نین بەڵام تەنها دژی ئەوانەین کە لە ئیسلامیش لایان داوە؟!

**دووهەم:** دەیانەوێت دوو بەرەکی لەنێوان موسڵماناندا دروست بکەن کە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر دەسەڵاتو هێزی ئیسلام کە کوفر هەرچەندزۆرو خاوەن هێزبێت ناتوانێت ڕاستەوخۆ دژی ئایینی پاکی ئیسلام ڕاوەستێت.

(٥٠) بلێ: ئەگەر من لە ڕاستی لامداوە ئەوە تەنها تاوانی بۆ خۆمەو ئەگەر ڕێگای ڕاستیشم گرتوە ئەوەش بەهۆی ئەوەیە کە پەروەردگارم وەحی کردوەتە لامو کردومی بە پێغەمبەری خۆی بەڕاستی ئەو بیسەری هەمو قسەکانمانەو نزیکە لێمانەوە.

(٥١) ئای چاوت پێیان بکەوتایە ئەو کاتەی کە بەبینینی ئەو سزا گەورانە ترسان، جا ئیتر هیچ ڕێگەی دەرچونیان نیە، هەر کە دەرچون لەگۆڕەکانیانەوە گیراو ڕزگاریان نابێت.

(٥٢) جا لەو حاڵەدا وتیان: باوەڕمان بەو هێناوە، جا چۆن دەبێت بەدەست هینانی ئیمان لە شوێنێکدا کە زۆر دورن لەو شوێنەی کە دەبوایە باوەر بهێنن؟ واتە: ئەو دنیایەی کە ئیستا زۆر دوورن لێی شوێنی باوەرهێنان بو نەك ئێرە.

(٥٣) جا چۆن دەبن بەباوەردار لەکاتێکدا ئەوان پێش ئیستا لەدنیادا بە قورئانو بەڵێنەکان بێباوەربون، وە دوور لە هەمو ڕاستیەك دەمیان لەشتانێك دەکوتا کەهیچ عیلمو زانستێکیان لەو بارەوە پێ نەبو.

(٥٤) تازە لە نێوان ئەوانو ئەو شتەی کە ئارەزۆی دەکەنو پێیان خۆشە ـ وەك: تەوبە لێوەرگرتنیان و باوەڕ هێنان لە دوارۆژداوو چونە ناو بەهەشتەوە ـ بەربەست دانرا هەروەك ئەوەی کە کرا بە هاوشێوەکانیان لە پێش ئەواندا. بەڕاستی ئەوەی کە ئەمڕۆ دەڵێن باوەڕمان پێی هێناوە لە دنیادا زۆر بە گومانبون تێیداو گاڵتەیان پێدەکرد، جا وا ئەمڕۆ تۆڵەی بەرهەمی کردارە چەوتەکانی خۆیان وەردەگرنەوە.

قُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَمَا يُبْدِئُ ٱلْبَٰطِلُ وَمَا يُعِيدُ ﴿٤٩﴾ قُلْ إِن ضَلَلْتُ فَإِنَّمَآ أَضِلُّ عَلَىٰ نَفْسِى ۖ وَإِنِ ٱهْتَدَيْتُ فَبِمَا يُوحِىٓ إِلَىَّ رَبِّىٓ ۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ قَرِيبٌ ﴿٥٠﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ فَزِعُوا۟ فَلَا فَوْتَ وَأُخِذُوا۟ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٥١﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِهِۦ وَأَنَّىٰ لَهُمُ ٱلتَّنَاوُشُ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ وَقَدْ كَفَرُوا۟ بِهِۦ مِن قَبْلُ ۖ وَيَقْذِفُونَ بِٱلْغَيْبِ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٣﴾ وَحِيلَ بَيْنَهُمْ وَبَيْنَ مَا يَشْتَهُونَ كَمَا فُعِلَ بِأَشْيَاعِهِم مِّن قَبْلُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ فِى شَكٍّ مُّرِيبٍۭ ﴿٥٤﴾

٣٥ سُورَةُ فَاطِرٍ ٤٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ جَاعِلِ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ رُسُلًا أُو۟لِىٓ أَجْنِحَةٍ مَّثْنَىٰ وَثُلَٰثَ وَرُبَٰعَ ۚ يَزِيدُ فِى ٱلْخَلْقِ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ مَّا يَفْتَحِ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ مِن رَّحْمَةٍ فَلَا مُمْسِكَ لَهَا ۖ وَمَا يُمْسِكْ فَلَا مُرْسِلَ لَهُۥ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ۚ هَلْ مِنْ خَٰلِقٍ غَيْرُ ٱللَّهِ يَرْزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ۚ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُؤْفَكُونَ ﴿٣﴾

## ٣٥ سورەتی فاتیر ٤٥

سورەتی فاتیر کە سیو پێنجەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، چلو پێنج ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چلو سێهەمەو پاش سورەتی (الفرقان)و پێش (مريم) دابەزیوەو سورەتی (ألْمَلائِكة) یشی پێدەوترێت.

بەناوی الله ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) تەوای سوپاس بۆ الله، زاتی الله لە سەرەتای پێنج سورەتدا بەم وشە سوپاسی زاتی خۆی کردوەو ئەمەش تەنها شایانی ئەو زاتەیە و هەر وەکو زاتی بێوێنەیە لەسیفاتیشدا بێوێنەیە، هەر ئەو دەتوانێت وەسفو سەنای خۆی بکات، چونکە بۆ جگە لە زاتی ئەو هەر کەس سوپاسی خۆی بکات ناشرینە، بەڵام بۆ الله زۆر بەجێیە چونکە هەمو چاکەیەكو لە هەر کەسێکەوە بێت بە مەیلی اللهیەو ئەگەر ئەو نیعمەتی خۆی بەو کەسە نەدایەو یارمەتیو ڕێنمایی نەکردایە ئەو چاکانەی نەدەکرد، کەواتە هەمو چاکەیەك سەرچاوەکەی اللهیە، لەبەر ئەوە هەر خۆی شایانی سوپاسە چ خەڵك بیکات یان نەیکات، ئەمە بۆ چوار جێگا کەی تر بزانە کە لە سەرەتای سورەتی (فاتیحەو ئەنعامو کەهفو سەبەئە )وەیە.

ئەو الله یەی کە بەدیهێنەری ئاسمانانو زەوییە بە بێ ئەوەی کەلە پێشدا وێنەی بوبێت. فریشتەکانی کردوە بە نێردراو بۆ لای

وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدۡ رُسُلٌ مِّن قَبۡلِكَۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٌ ﴿٧﴾ أَفَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ فَرَءَاهُ حَسَنٗاۖ فَإِنَّ ٱللَّهَ يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۖ فَلَا تَذۡهَبۡ نَفۡسُكَ عَلَيۡهِمۡ حَسَرَٰتٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِمَا يَصۡنَعُونَ ﴿٨﴾ وَٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابٗا فَسُقۡنَٰهُ إِلَىٰ بَلَدٖ مَّيِّتٖ فَأَحۡيَيۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَاۚ كَذَٰلِكَ ٱلنُّشُورُ ﴿٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلۡعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلۡعِزَّةُ جَمِيعًاۚ إِلَيۡهِ يَصۡعَدُ ٱلۡكَلِمُ ٱلطَّيِّبُ وَٱلۡعَمَلُ ٱلصَّٰلِحُ يَرۡفَعُهُۥۚ وَٱلَّذِينَ يَمۡكُرُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞۖ وَمَكۡرُ أُوْلَٰٓئِكَ هُوَ يَبُورُ ﴿١٠﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ جَعَلَكُمۡ أَزۡوَٰجٗاۚ وَمَا تَحۡمِلُ مِنۡ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلۡمِهِۦۚ وَمَا يُعَمَّرُ مِن مُّعَمَّرٖ وَلَا يُنقَصُ مِنۡ عُمُرِهِۦٓ إِلَّا فِي كِتَٰبٍۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿١١﴾

پێغەمبەران کە ئەو فریشتانە خاوەنی دوو باڵو سێ باڵو چوار باڵن، وە زیاد ئەکات لەو باڵانەیش هەر چەندێك ئارەزۆی لێ بێت، جا بەڕاستی الله دەسەڵاتدارە بەسەر هەمو شتێکدا.

﴿٢﴾ الله هەر کاتێك دەرگای خێر لە خەڵك بکاتەوە هیچ کەس ناتوانێت ڕێگای لێ بگرێت خۆ ئەویش گرتیەوە لە پاش خۆی کەس ناتوانێت ئەو خێرە ڕەوانە بکاتو هەر ئەوە بە دەسەڵاتو کاربەجێ.

لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{اللَّهُمَّ لاَ مَانِعَ لِمَا أَعطَيتَ وَلاَ مُعطِيَ لِمَا مَنَعْت، وَلاَ ينفعُ ذَا الجَدِّ مِنكَ الجَدّ/متفق عليه/

ئەی پەروەردگار هیچ ڕێگرێك نیە بۆ ئەوەی کە تۆ بیدەیت و هیچ کەسێکیش ناتوانێت بیدات ئەو شتەی کە تۆ بەرگری بکەیت، وەهیچ خاوەن دەسەڵاتێك لەجیاتی تۆدا دەسەڵاتەکەی سوودی پێنادات}

﴿٣﴾ ئەی خەڵکینە بیر لەو خەیرو بەرەکەتە زۆرەی الله بکەنەوە کە ڕژاندویەتی بەسەرتاندا، ئایا لە ئاسمانانو زەویدا جگە لە الله دروستکەرێکی تر هەیە کە ڕۆزیتان پێبدات؟ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لەو، دەی بۆ ئاوا لا دەدەن لە ڕێگای ڕاست؟!

﴿٤﴾ خۆ ئەگەر تۆ بە درۆ دەخەنەوەو باوەڕت پێناکەن، جا تۆ خەم مەخۆو دڵتەنگ مەبە چونکە بەڕاستی پێغەمبەرانی پێش تۆیش بە درۆ خرانەوەو سەر ئەنجامی ڕاستانو ناڕاستانیشت بۆ باسکراوە، جاتۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرەو هیچی ترو سەرئەنجامی هەمو کارەکانیش هەر تەنها بۆ لای الله دەگەڕێنرێنەوە.

﴿٥﴾ ئەی خەڵکینە بەڕاستی بەڵێنی الله بۆ هاتنی ڕۆژی دوایی‌و حیسابو دۆزەخو بەهەشت ڕاستە، جا با ئەم ژیانەی دنیا سەر گەرمتان نەکاتو شەیتانیش بە بەخشندەی الله فریوتان نەدات. جا هەر لەسەر تاوانو ستەم بڕۆنو بڵێن خوا بەرەحمە ڕاستە خوا بەرەحمە بەڵام تۆڵەیشی سەختە.

﴿٦﴾ بەڕاستی شەیتان دوژمنتانە سا ئێوەیش ئەو بە دوژمنی خۆتان بزانن، ئەو پێڕو تاقمی خۆی بانگ دەکات تا ببن بە یارانی ئاگری کڵپەدار وبیانخاتە دۆزەخەوە.

﴿٧﴾ ئەو کەسانەی کە خوا نەناسنو بەگوێی شەیتانیان کردوە سزایەکی توندیان بۆ هەیەو ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە بۆ ئەوانە لێبوردنی خواو پاداشتی گەورە هەیە. بەڵێ ئەوەی کە باسکرا سەر ئەنجامی پەیڕەوانی شەیتانو پەیڕەوانی الله بو، جا بزانە کام لەو دوو سەرئەنجامە بۆ خۆت هەڵدەبژێریت؟

﴿٨﴾ ئایا ئەو کەسەی کە کردارە خراپەکەی بۆ جوانکراوەو خۆیشی بە جوانی دەزانێت وەکو ئەو کەسە وایە کە وا نەبێت؟ بێگومان زاتی الله هەر کەس حەز بکات گومڕای دەکاتو هەر کەسێکیش حەز بکات شارەزای دەکات، بەڵام الله ئەم کارە بە زۆر ناکات بە کەس بەڵکو خەڵکی خۆی سەرپشکە لە هەڵبژاردنی ڕێگا، چونکە هێنانە دنیامان هەر بۆتاقی کردنەوەیە، بەڵام بۆیە ئەمە دەفەرموێت تا دڵنەوایی پێغەمبەر ﷺ بکاتو تێی بگەیەنێت کە تۆ تەنها ڕاگەیاندنت لەسەرە، جا نەکەیت کە خۆت لەناو ببەیت بە خەفەتو داخ لەسەر ئەوەی کە ئەوان خراپەیان بۆ جوان کراوەو پەیڕەوی لە ڕاستی ناکەن؟ بێگومان الله دەزانێت بەوەی کە ئەوان دەیکەن.

﴿٩﴾ الله ئەو زاتەیە کە با ڕەوانە دەکات، جا ئەویش هەور دەخاتە جموجوڵ ئەوسا دەینێرین بۆ ئەو وڵاتەی کە مردوە لە بێ ئاویدا ئەوسا بەو ئاوە ئەو زەویە پاش مردنی بە کانیاو و بەگژوگیا زیندوی دەکەینەوە، زیندوکرنەوەی ئێوەیش پاش مردن هەر بەم شێوەیە. جا چۆن ئەوە بە چاوی خۆتان دەیبینن‌و گومانتان تێیدا نیە دەبێت هەر بەم شێوەیەش گومانتان لە زیندو کردنەوەی خۆتاندا نەبێت.

(١٠) هەر کەسێك دەسەڵاتو هێزی دەوێت با بزانێت کە تەواوی دەسەڵات هی اللّٰهیە، قسەی باش هەر بۆ لای ئەو سەر دەکەوێتو کرداری چاك بەرزی دەکاتەوەو پەسەند کراوی لایاللّٰه دەبێت، جا ئەو کەسانەی کە فڕوفێڵە خراپەکان دەکەن سزای توندیان بۆ هەیەو فڕوفێڵی ئەوان هەر بۆ خۆی لەناودەچێ.

(١١) خوٚ اللّٰه ئەو زاتەیە کە سەرەتا ڕاستەوخۆ لە خاك دروستیکردون کە ئادەمە ﷺ لە ڕاستیدا هەمو مرۆڤێك ناڕاستەوخۆ لەخاك دروست دەبێت، پاشان دروستیکردون لە دڵۆپەیەك ئاو پاشان کردنی بە نێرو مێو هیچ مێینەیەك باردار نابێتو ئەو بارەیش دانانێت مەگەر بە زانیاری ئەو زاتە بێتو هیچ تەمەندارێك تەمەنی پێنادرێتو هیچیش لەو تەمەنە کەم ناکرێتەوە مەگەر بەو شێوەی کە لە (لوح المحفوظ)دایە، بەڕاستی ئەمە لەلای اللّٰه ئاسانە. چونکە هەر خۆیەتی بەدیهێنەری ئەم بونەوەرە.

(١٢) ئەو دوو دەریا کەهەن وەکو یەك نین ئەمیان شرینەو سازگارەو چاك لە گەرو دەچێتە خوارەوەو ئەوی تریان سوێرەو لە سوێریدا تاڵەو لە هەردووکیان گۆشتی تەرچكو ناسك دەخۆنو شتی بەنرخی لێدەردەهێنن وەکو دوڕو یاقوتو سەدەفو خۆتانی پێ جوان دەکەن، خۆ تۆ دەبینی کەشتی بەناویدا دێنو دەڕۆن بۆ ئەوەی لە نازو نیعمەتی ئەو بەهرەمەند ببن، جا بەڵکو ئێوەش سوپاسی ئەو زاتە بکە ن.

(١٣) اللّٰه شەو دەخاتە ناو ڕۆژەوەو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەوەوە (بە کەمو زیادکردنیان لە کەشەکانی ساڵدا هەر جارەی یەکێکیان زیاد دەکات بەگوێرەی پێویستی خەڵك)و ڕۆژو مانگی ڕامکردوە کە هەمویان دێنو دەچن بۆ کاتێکی دیاریکراو واتە: هاتوچۆیان بۆ تەواو کردنی ئەو ماوەیە تا بگەین بەو کاتەی کە ناوبراوە کە هاتنی قیامەتو حیسابە، جا ئەوەی ئەو کارە دەکات اللّٰهیە کە پەروەردگارتانەو تەواوی موڵك هەر موڵکی ئەو زاتەیەو ئەو کەسانەی کە ئێوە دەیان پەرستن بێجگە لە اللّٰه خاوەنی کفنە سپیەکەی پۆشاکی تۆوی خورمایەکیش نین.

(١٤) ئەگەر بانگیان بکەنو بیان پەرستن ئەوان هیچ داواو بەندایەتیو بانگێکی ئێوە نابیسن، وە ئەگەر بیشی بیسن هیچ وەڵامێکێتان نادەنەوەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا نکولی دەکەن لەوەی کە ئێوە ئەوانتان کرد بێت بە هاوبەشی اللّٰهو بەندایەتیتان بۆ کردبن، جا بزانە وەك ئەو زاتە زۆر ئاگادارە کە اللّٰهیە هیچ کەسێکی تر ئاوا هەواڵێکی ئەم دوو ژیانەت پێنادادتو ئاوا

وَمَا يَسْتَوِي ٱلْبَحْرَانِ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا۟ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ يُولِجُ ٱلَّيْلَ فِى ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِى ٱلَّيْلِ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ كُلٌّ يَجْرِى لِأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكْفُرُونَ بِشِرْكِكُمْ ۚ وَلَا يُنَبِّئُكَ مِثْلُ خَبِيرٍ ﴿١٤﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِ ۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿١٥﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٦﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿١٧﴾ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۚ وَإِن تَدْعُ مُثْقَلَةٌ إِلَىٰ حِمْلِهَا لَا يُحْمَلْ مِنْهُ شَىْءٌ وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰٓ ۗ إِنَّمَا تُنذِرُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُم بِٱلْغَيْبِ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَمَن تَزَكَّىٰ فَإِنَّمَا يَتَزَكَّىٰ لِنَفْسِهِۦ ۚ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾

سەرئەنجامی هەمو کارێك نازانێت، جا کەواتە گوێ لە ئێمە بگرەو ڕاستیەکان تەنها لەئێمە وەرگرە.

(١٥) ئەی خەڵکینە هەر ئێوەن نیازمەندن بە اللّٰهو اللّٰه هەر خۆیەتی بێنیازو سوپاسکراو. جا چی ئێوە سوپاسی بکەن یان نە.

(١٦) ئەگەر ئەو زاتە حەز بکات ئێوە لا دەباتو دروستکراوێکی تازە دەهێنێت.

(١٧) خۆ ئەمە لەلای اللّٰه شتێکی گران نیە بەڵکو ئەمە لەلای ئەو ئاسانە.

(١٨) هیچکەس باری تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێتو هەر کەس تاوانی خۆی لە گەردنی خۆیدایە جا ئەگەر کەسێکیش کە باری تاوانی زۆر گرانە لەسەری بانگ بکاتە کەسێکی تر کە بۆی هەلگرێت هیچ لەو تاوانەی لێ هەڵناگرێت ئەگەرچی بانگ کراوەکەش خزمی نزیکی خۆی بێت (وەکو باوكو منداڵی خۆی) بەڵکو هەمو کەس لە ترسی ئەویتر هەڵدێت نەوەکو لەوێ داوای شتی لێ بکات، تۆ هەر ئەوەندەت لەسەر پێویستە کە ئەو کەسانەی لە پەنامەکیدا لە پەروەردگاری خۆیان دەترسنو نوێژ دەکەن بترسێنیتو هەر کەسێك خۆی پاك بکاتەوە ئەوە تەنها سوودی خۆپاك کردنەوەکەی بۆ خۆیەتی، وە سەرەنجامی هەموان هەر بۆ لای اللّٰه یە، جا لەوێدا هەر کەس بەشێوەی کاری خۆی پاداشتو سزا وەردەگرێت. لەفەرمودەدا هاتوە کە باوكو

وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ ﴿١٩﴾ وَلَا ٱلظُّلُمَٰتُ وَلَا ٱلنُّورُ ﴿٢٠﴾ وَلَا ٱلظِّلُّ وَلَا ٱلْحَرُورُ ﴿٢١﴾ وَمَا يَسْتَوِي ٱلْأَحْيَآءُ وَلَا ٱلْأَمْوَٰتُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُسْمِعُ مَن يَشَآءُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُسْمِعٍ مَّن فِي ٱلْقُبُورِ ﴿٢٢﴾ إِنْ أَنتَ إِلَّا نَذِيرٌ ﴿٢٣﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ۚ وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ ﴿٢٤﴾ وَإِن يُكَذِّبُوكَ فَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلزُّبُرِ وَبِٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ أَخَذْتُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا ۖ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿٢٦﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ جُدَدٌۢ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلْأَنْعَٰمِ مُخْتَلِفٌ أَلْوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ۗ إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَٰٓؤُا ۗ إِنَّ ٱللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتْلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُوا ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُوا مِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ سِرًّا وَعَلَانِيَةً يَرْجُونَ تِجَٰرَةً لَّن تَبُورَ ﴿٢٩﴾ لِيُوَفِّيَهُمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدَهُم مِّن فَضْلِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ غَفُورٌ شَكُورٌ ﴿٣٠﴾

کوڕێك هاتنه خزمەتی پێغەمبەر ﷺ زۆر لەیەك دەچون، جا پێغەمبەر ﷺ بەکابرای فەرمو: {ابْنُكَ هَذَا قَالَ إِي وَرَبِّ الْكَعْبَةِ قَالَ حَقًّا قَالَ أَشْهَدُ بِهِ قَالَ فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ضَاحِكًا مِنْ ثَبْتِ شَبَهِي فِي أَبِي وَمِنْ حَلِفِ أَبِي عَلَيَّ ثُمَّ قَالَ أَمَا إِنَّهُ لَا يَجْنِي عَلَيْكَ وَلَا تَجْنِي عَلَيْهِ وَقَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى /ابوداود.صححه الالباني/ ئەمە کوڕتە؟ وتی: ئەرێ بە پەروەردگاری کەعبە. فەرموی: بەراستی؟ وتی: شایەتی دەدەم کەکوڕمە، جاکوڕەکە کە فەرمودەکەی هێناوە دەڵێ:جا پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنی لەبونی شێوەی من لەباوکمداو لەوسوێندەی باوکم لەسەرمن پاشان فەرموی: ئاگادار بە، بێگومان هەر تاوانێ کە ئەو بیکات لەسەر تۆ نیەو تاوانێکیش کە تۆ بیکەیت لەسەر ئەونیە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ ﴿هیچ کەس باری تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێ﴾ی خوێندەوە}

(١٩) خۆ کوێرو چاوساغ وەکو یەك نین. واتە: کافرو موسڵمان.

(٢٠) خۆ تاریکیەکانو ڕووناکیش وەکو یەك نین. واتە: کوفرو ئیمان.

(٢١) خۆسێبەرو گەرمایش وەکو یەك نین. واتە: بەهەشتو دۆزەخ.

(٢٢) زیندوەکانو مردوەکان وەك یەك نین. واتە: باوەڕدارو خوا نەناس، بێگومان اللهدەبیسێنێت و ڕێنمونی دەکات ئەو کەسەی حەز بکات بۆ باوەڕ هێنانو بەندایەتی الله بەڵام تۆ ناتوانیت ببیسێنیو ڕێنمونی بکەیت ئەو کەسەی کە لەناو گۆڕدایە. واتە خوا نەناس وەك مردوی ناوگۆڕە چەند دوورە کەتۆ قسە بەمردوی ناوگۆڕ ببیسێنی کەشتێکی محاڵە ئەوەندە دوورە کە هیدایەتی بدەیت چونکە هیدایەت بەدەست تۆ نیە.

(٢٣) تۆ هەر ترسێنەریت بە سەرئەنجامی کوفرو خوانەناسی.

(٢٤) بەڕاستی ئێمە تۆمان بە پەیامێکی ڕاستەوە ناردوە کە موژدەدەر بیت بە بەهەشت بەو کەسانەی کە باوەڕ دەهێنن‌و ترسێنەر بیت بەو کەسانەی کە باوەڕ ناهێنن، ئەوسا هیچ گەلێکیش نەبوە کە ترسێنەریان بۆ نەهات بێت.

(٢٥) جا ئەگەر ئەوان باوەڕ بە تۆ نەکەن‌و بەدرۆزنت بزانن (تۆ دڵتەنگ مەبەو خەم مەخۆ چونکە) بەراستی ئەو کەسانەی پێش ئەوانیش کە پێغەمبەریان بە بەڵگەی ئاشکراو سیپارەو پەڕاوی ڕووناك کەرەوە هاتە لایان باوەڕیان نەهێنا.

(٢٦) پاشان ئەوانەی کە خوانەناس بون تۆڵەمان لێ سەندن، جا بزانە تۆڵەی من بۆیان چۆن بو؟ واتە با ئەم گەلەی تۆیش بترسن ئەگەر باوەڕت پێ نەکەن کە الله وەبەر غەزەبیان بخاتو تۆڵەیان لێوەربگرێت.

(٢٧) ئایا تۆ نەتبینیوە کە الله لە ئاسمانەوە ئاوی ناردوەتە خوارەوە، ئەوسا بەو ئاوە بەروبوومێکی زۆر کە ڕەنگیان لە یەك جیابو سەوزو سورو زەردمان وەبەر هێنا، وە لە چیاکانیش ڕێگایانێکی جۆراوجۆر لە ڕەنگدا سپی‌و سوور کە ڕەنگیان لە یەك جیابو، سووری تۆخ‌و سووری کاڵ‌و سپی‌و سپی تۆزاوی‌و زەردو زەردی کاڵ‌و ڕەش‌و ڕەشی زۆر تۆخیش.

(٢٨) جا لەناو خەڵك‌و لە گیانەوەران‌و مەڕو ماڵاتدا جیاوازیان هەیە لەجۆرو شێوەو ڕەنگیاندا هەروەکو چۆن لە بەروبووم‌و چیاکاندا ڕەنگی جۆراو جۆریان بو. ئەوسا لەناو بەندەکاندا هەر زانایانن کە لەالله دەترسن چونکە هەرئەوانن کە الله بە جوانی دەناسن، بەڕاستی الله دەسەڵاتدارو چاوپۆشیکەرە لە تاوانی بەندەکانی. وتراوە کە زانا سێ جۆرە: جۆرێکیان هەم الله دەناسێت‌و هەم فەرمانەکانی. وە جۆرێکی تریان زانیاری هەیە لەسەر فەرمانەکانی بەڵام الله ناناسێت. وەجۆرێکیان زانیاری هەیە لەبارەی اللهوە بەڵام فەرمانەکانی نازانێت، جا ئەو کەسەی کە الله دەناسێت‌و فەرمانەکانیشی دەزانێت ئەوە ئەو زانایانەن کە لە خوا دەترسن بەڵام ئەو کەسەی کە فەرمانەکانی دەناسێت‌و زاتی الله ناناسێت ئەوە ئەو کەسەیە کە سنورەکان‌و پێویستیەکان دەزانێت بەڵام لە خوا ناترسێت، جا ئەوانە زۆر پڕمەترسین بۆ فریودانی خەڵك‌و لاڕێ کردنیان، ئەوەش کە زاتی الله دەناسێت‌و

فەرمانەکانی ناناسێت ئەوە ئەو کەسەیە کە لە خوا دەترسێت بەڵام سنورو پێویستیەکانی نازانێت، جا ئەمانەش لەبەندایەتی کردندا دوچاری گەلێك بیدعەو خەرافیات دەبن.

هەر لە بارەی پلەی زاناو زانستەوە پێغەمبەری خوا دەفەرموێ: {مَنْ سَلَكَ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا سَلَكَ اللَّهُ بِهِ طَرِيقًا مِنْ طُرُقِ الْجَنَّةِ وَإِنَّ الْمَلَائِكَةَ لَتَضَعُ أَجْنِحَتَهَا رِضًا لِطَالِبِ الْعِلْمِ وَإِنَّ الْعَالِمَ لَيَسْتَغْفِرُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالْحِيتَانُ فِي جَوْفِ الْمَاءِ وَإِنَّ فَضْلَ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِ الْقَمَرِ لَيْلَةَ الْبَدْرِ عَلَى سَائِرِ الْكَوَاكِبِ وَإِنَّ الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ وَإِنَّ الْأَنْبِيَاءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِينَارًا وَلَا دِرْهَمًا وَرَّثُوا الْعِلْمَ فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍّ وَافِرٍ /ابوداود وصححه الالباني/هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێت کەبیەوێ لەم ڕێگاوە زانستی دەست بکەوێت خوا دەیخاتە سەر ڕێگایەك لە ڕێگای بەهەشت، بێگومان کەفریشتەکان باڵیان رادەخەن بۆ زانستخوازان بەنیشانەی رازی بونیان لەزاناو زانستخوازان، جا بێگومان کە زانستخوازان ئەوەی کە لەئاسمانانو زەویدایە تەنانەت ماسیەکان لەناودەریادا داوای لێخۆشبونی بۆ دەکەن، خۆبێگومان کە ڕێزی زانا بەسەر خواناسدا وەك ڕێزی مانگی چواردەیە بەسەر هەموو ئەستێرەکاندا، جابێگومان کەزانایان کەلەپور بەری پێغەمبەرانو بێگومانیش کە پێغەمبەران (سەلامی خوایان لێ بێ) هیچ دینارو درهەمێکیان لێ بەجێ نەماوە، ئەوان زانیاریان لێ بەجێماوە ـ کەپەیامەکەی خوایە ـ جا هەر کەسێك ئەوەی دەستکەوتبێت بەشێکی فرەوانی دەستکەوتوە}.

﴿٢٩﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کە پەراوی ﷲ دەخوێننەوەو بەردەوامن لەسەر نوێژەکانیانو لەوەی کە پێمان داون بە پەنهانیو بە ئاشکرا دەیبەخشن، ئەوانە بە هیوای بازرگانیەکن کە رەزامەندی خواو بەهەشتی پڕ نازو نیعمەتیەتی کە هەرگیز لەناو ناچێت.

﴿٣٠﴾ تاﷲ پاداشتیان بداتەوەو لە چاکەی خۆیشی بۆیشیان زیاد بکات، بەڕاستی ئەو لێبوردەیە لە تاوانی بەندەکانیو بە چاکەی بەندەکانی دەزانێتو پاداشتیان دەداتەوە.

﴿٣١﴾ جا ئەوەی کە نیگامان کردوەتە لای تۆ لەو پەڕاوە کە قورئانە هەر ئەوە ڕاستەو دان دەنێت بەو پەڕاوانەی کە لە پێش خۆیدا هاتون، بێگومان کە ﷲ زۆر ئاگادارە بە هەڵسو کەوتی بەندەکانی، بینەرو چاودێریکاری کۆششەکانیانە.

﴿٣٢﴾ لە پاشان بەو کەسانەی کە هەڵمان بژاردوون لە بەندەکانمان ئەو پەڕاوەمان پێدان، جا لەناو ئەواندا کەسانێك هەبون کە ستەمیان لە خۆیان کردو کەسانێکی تر لەوان مامناوەند بوونو

وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ هُوَ ٱلۡحَقُّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِعِبَادِهِۦ لَخَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٣١﴾ ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ فَمِنۡهُمۡ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٣٢﴾ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ يَدۡخُلُونَهَا يُحَلَّوۡنَ فِيهَا مِنۡ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٖ وَلُؤۡلُؤٗاۖ وَلِبَاسُهُمۡ فِيهَا حَرِيرٞ ﴿٣٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَذۡهَبَ عَنَّا ٱلۡحَزَنَۖ إِنَّ رَبَّنَا لَغَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِيٓ أَحَلَّنَا دَارَ ٱلۡمُقَامَةِ مِن فَضۡلِهِۦ لَا يَمَسُّنَا فِيهَا نَصَبٞ وَلَا يَمَسُّنَا فِيهَا لُغُوبٞ ﴿٣٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَهُمۡ نَارُ جَهَنَّمَ لَا يُقۡضَىٰ عَلَيۡهِمۡ فَيَمُوتُواْ وَلَا يُخَفَّفُ عَنۡهُم مِّنۡ عَذَابِهَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي كُلَّ كَفُورٖ ﴿٣٦﴾ وَهُمۡ يَصۡطَرِخُونَ فِيهَا رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا نَعۡمَلۡ صَٰلِحًا غَيۡرَ ٱلَّذِي كُنَّا نَعۡمَلُۚ أَوَلَمۡ نُعَمِّرۡكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَآءَكُمُ ٱلنَّذِيرُۖ فَذُوقُواْ فَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ عَٰلِمُ غَيۡبِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٣٨﴾

کەسانێکی تریان هەبوە کە بەهۆی چاکەکانیانەوە بە یارمەتی ﷲ لەهاوەڵانیان پێشدەکەوتن، ئا ئەوەیە ڕێزو چاکەی گەورە کە خوا داویەتی بەو بەندەیە کە پێشبڕکێ دەکات لە چاکە کردندا. لەفەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئەم ئایەتەوەفەرمویەتی:{ هَؤُلَاءِ كُلُّهُمْ بِمَنْزِلَةٍ وَاحِدَةٍ وَكُلُّهُمْ فِي الْجَنَّةِ /الترمذي.صححه الالباني/ ئەمانە هەمویان لەیەك ئاستدان لەوەی کە ئومەتی پێغەمبەرن ﷺ و هەمویان دەچنە بەهەشتەوە} بەڵام جێگایان لە بەهەشتدا بەگوێرەی کردارەکانی خۆیانە.

﴿٣٣﴾ کە ئەو ڕێزە گەورەش بریتیە لەوەی کەدەچنە ناو باخچەکانی دانیشتنەوە کە لە ناویدا بە دەست بەندانێك کە لە ئاڵتونەو بە مرواریش دەنەخشێنرێن ، وە پۆشاکیشیان لەناویدا هەوریشمە.

﴿٣٤﴾ ئەوسا دەڵێن: سوپاس بۆ ئەو زاتەی کە تەواوی نارەحەتیەکانی لەسەر ئێمە لابرد، بێگومان کە پەروەردگارمان زۆر لێبوردەیەو بە چاکەی بەندەکانی دەزانێتو پاداشتیان دەداتەوە.

﴿٣٥﴾ ئەو کەسەی کە لەماڵی دانیشتنو هەمیشەییدا لە چاکەی خۆی جێگای کردینەوە نە هیچ ڕەنجو نارەحەتی تێیدا هەست دەکەینو نە دوچاری هیچ ماندوبوونێك دەبین تێیدا. جا بەم

هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَكُمْ خَلَٰٓئِفَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَمَن كَفَرَ فَعَلَيْهِ كُفْرُهُۥ ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ عِندَ رَبِّهِمْ إِلَّا مَقْتًا ۖ وَلَا يَزِيدُ ٱلْكَٰفِرِينَ كُفْرُهُمْ إِلَّا خَسَارًا ﴿٣٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا۟ مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمْ ءَاتَيْنَٰهُمْ كِتَٰبًا فَهُمْ عَلَىٰ بَيِّنَتٍ مِّنْهُ ۚ بَلْ إِن يَعِدُ ٱلظَّٰلِمُونَ بَعْضُهُم بَعْضًا إِلَّا غُرُورًا ﴿٤٠﴾ ۞ إِنَّ ٱللَّهَ يُمْسِكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ أَن تَزُولَا ۚ وَلَئِن زَالَتَآ إِنْ أَمْسَكَهُمَا مِنْ أَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤١﴾ وَأَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَئِن جَآءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى ٱلْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ أَوَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَكَانُوٓا۟ أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً ۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ﴿٤٤﴾

شێوەیە پەروەردگار پاداشتی خواناسانو پارێزکاران دەداتەوە، ئینجا باسی پاشەڕۆژی خوا نەناسانیش دەکاو دەفەرموێ:

(٣٦) ئەوسا ئاگری دۆزەخ بۆ ئەو کەسانەیە کە خوا نەناسن کە هیچ بڕیارێك لەو شوێنەدا نادرێت بەسەریاندا تا بمرنو هیچیش لەو سزایە سوك ناکرێت کە لە سەریانە بەهەمان شێوە ئێمە سزای هەمو خوانەناسان دەدەین.

(٣٧) جا ئەوان لەناو ئەو ئاگرەدا هاوار دەکەنو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لەم ئاگرە دەرمان بهێنە، ئیتر ئیشی چاك دەکەین نە ئەو ئیشەی کە لە پێشدا کردوومانە، واتە: لەو کاتەدا پەشیمان دەبنەوە لە کارە خراپەکانی دنیاو داوای گەڕانەوە لە خوا دەکەن بەڵام بێسوودەو پێیان دەفەرموێ: ئایا ئەوەندە تەمەنتان پێنەدان کە بیری تێدا بکەنەوەو چاکەو خراپە بزانن؟ خۆ ترسێنەریشتان بۆ ڕەوانە کرا، سا سزای خۆتان بچەژن چونکە بۆ ستەمکاران هیچ یارمەتیدەرێك نیە. پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی:{أَعْذَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ إِلَى امْرِىءٍ أَخَّرَ عُمْرَهُ حَتَّى بَلَغَ سِتِّينَ سَنَةً/ النسائي، صححه الالباني/ اللّٰه ی دەسەڵاتدارو گەورە بەهانەی نەهێشتوە بۆ کەسێك کە ماوەی پێبدات تا تەمەنی دەگاتە شەست ساڵ}.

(٣٨) بەڕاستی اللّٰه زانەری شاراوەکانی ئاسمانانو زەویە، بەڕاستی ئەو زانەرە بەوەی کە لەناو دڵەکاندا هەیە لە نیەتی چاكو خراپو هیچ لەو ون نابێت، چونکە زاناو وردبینەو هەر خۆی خەتەراتی دڵ دروست دەکات، جا چۆن دە بێ پێی نەزانێ.

(٣٩) اللّٰه ئەو زاتەیە کە کردونی بە جێ نشینی یەکتر لەم زەویەدا، ئەوسا هەر کەس خوا نەناس بێت ئەوە زیانی خوا نەناسیەکەی هەربۆ خۆیەتیو کوفری کافران زیاتر هەر ڕقی پەروەردگاریان زیاد دەکاتو کافران بەو کوفرەیان هەر زیاتر ڕەنجەڕۆ دەبن.

(٤٠) بڵێ: پێم بڵێن ئەوانەی کە جگە لە اللّٰه بەندایەتیتان بۆ دەکەن پیشانم بدەن ئایا چییان لەم زەویەدا دروستکردوە؟ نەك هەر ئەوە، دەی پێم بڵێن: ئایا ئەوان هاوبەشێکیان هەیە لەناو ئاسمانەکانداو شتێکی بۆ بەدیهێنابن؟ نەك هەر ئەوەش، ئەی ئایا ئێمە پەڕاوێکمان پێداون لەبارەی ئەو خوانەناسیەوە کە ئەوان لەسەر چاو ڕۆشنی بن؟ نەخێر ستەمکاران هەندێکیان بە هەندێکیان جگە لە فریودانو هەڵخەڵەتاندن هیچ بەڵێنێکی تریان نەداوە بە پەیڕەوانیان. بەڵام پەیڕەوانیان نەزانو گێلو گەمژەن تا بە دادگای اللّٰه نەگەن بە ئاگا نایەن، جا ئەو کاتە پەنجەی پەشیمانی دەگەزن بەڵام بێ سوودە.

(٤١) بەڕاستی اللّٰه یە کە ئاسمانانو زەوی ڕاگرتوە ئەگەر بکەون جگە لەو هیچکەسی تر ناتوانێت ڕاگیریان بکات بەڕاستی ئەو بە حەوسەڵەیە لە دواخستنی سزا، زۆرخەتا پۆشیشە بۆبەندەکانی.

(٤٢) خوانەناسان بە توندی سوێندیان بە اللّٰه دەخوارد کە ـ دەیان وت ـ ئەگەر بێتو ترسێنەرێکمان بۆ بهاتبایە ئەو کاتە ئێمە لەو دوو گەلە (جولەکەو گاور) چاکتر ڕێگای ڕاستمان دەگرت، جا کاتێك کە پێغەمبەریان بۆ هات بەوە زیاتر لە ئایینو لە ڕاستی دوورکەوتنەوە.

(٤٣) هەر لەبەر لوت بەرزیو خۆبەزلگرتنیان لە ناو زەویداو فڕوفێڵی خراپ، خۆ زیانی فڕوفێڵی خراپیش هەر بۆ خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە، وتراوە "چاڵ هەڵکەن لە بێخ چاڵدایە" ئایا بێجگە لە چارەنوسی پێشوەکان چاوەڕوانی شتێکی تر هەن؟ ئەوسا تۆ نابینی هیچگۆڕانێك بۆ باوی اللّٰه، خۆ باوی اللّٰه جێگۆڕکەش ناکاتو اللّٰه هەرچی ویست بۆ هەر گەلێك پێی دەکاتو هیچکەسیش ناتوانێت بەرپەرچی بداتەوە.

(٤٤) ئایا ئەوان لەم سەر زەویەدا نەگەڕاون تا ببینن‌و بزانن ئەوانەی پێش ئەوان کە لەوانیش بەهێزتر بوون چیان بەسەر هاتوە؟ ئەوسا هیچ شتێکیش نە لەناو ئاسمانانو لەناو زەویدا نیە کە بتوانێ زۆرلە دەستی اللّٰه بسێنێت ، بێگومان ئەو زانایە بە هەمو ئاشکراو پەنهانیەکانی ناو ئاسمانانو زەویو دڵو دەروونی

مرۆڤەکانو بە توانایە بۆ تۆڵە سەندنو پاداشت دانەوەیان. بەڵێ ئەو زانایەو سەرئەنجامیان دەزانێو بە پەلە نیە لەتۆڵە سەندنەوەدا بەڵام نەزانو نەفامەکان لەم ماوەدانە ی ﷲ بە خراپی سوود وەردەگرن، ئینجادەفەرموێ:

(٤٥) جا ئەگەر ﷲ هەر کەسێك بەو کارە خراپەی کە دەیکات بەپەلە تۆڵەی لێ وەرگرتایە هیچ جموجۆڵکەرێکی لەسەر ئەم زەوییەدا نەدەهێشت، بەڵام ئەو زاتە ماوەیان پێدەداتو دوایان دەخات بۆ کاتی دیاریکراو، ئەوسا هەر کاتێك کاتی نەمانیان هات لەناویان دەبات، بەڕاستی ﷲ بینەری کاروباری بەندەکانیەتی، پاشان چاکان بە چاکەی خۆی بە چاکی پاداشت دەداتەوەو خراپانیش تۆڵەی ڕەفتارەکانیان بە دادپەروەرانە لێ وەردەگرێتەوە. واتە ستەم لەکەس ناکاتو کەسیشی لەبیر ناچێت.

سورەتی یاسین ٣٦ ٨٣

سورەتی یاسین کە سورەتی سی‌و شەشەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوەو هەشتاو سێ ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چلو یەکەمەو پاش سورەتی (الجن)و پێش (الفرقان) دابەزیوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) یاسین. لەو پیتانەن کە لە سەرەتای هەندێك لە سورەتەکانەوە هاتووە هەر ﷲ خۆی دەزانێت مەبەست چیە

(٢) سوێند بەم قورئانە کە هەموی داناییە.

(٣) بەبێگومان تۆ یەکێکی لە پێغەمبەرانی خودا.

(٤) کە لەسەر ڕێگای ڕاستیت کەئایینی ئیسلامە.

(٥) کەدا بەزیوە لەلایەن خاوەن دەسەڵاتی زۆر بە سۆزەوە.

(٦) بۆ ئەوەی تۆ گەلێك بترسێنی لە سزایﷲ کە باو باپیرانیان نەترسێنراونو پێغەمبەریان بۆ نەهاتووە بێئاگان لە ئایینو لە ڕاستی.

(٧) بەڕاستی بەڵێنی سزای (ﷲ) زۆرینەیانی گرتوەتەوە، سا ئیتر ئەوان باوەڕ ناهێنن؟

(٨) بێگومان کە ئێمە زنجیرێکمان لە ملیان کردەوە کە ئەو زنجیرە تا چەناکەیان شەتەکی داونوناتوانن سەریان دانەوێننوچاوشۆڕن.واتە ئەو کافرانە ئەوەندە دژی ئایینن وەك ئەوەی کە تەتەر پێچ کرابن لە سەر کوفرو نەتوانن لێی دەربچن.

وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِمَا كَسَبُواْ مَا تَرَكَ عَلَىٰ ظَهۡرِهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِعِبَادِهِۦ بَصِيرَۢا ﴿٤٥﴾

سُورَةُ يسٓ ٣٦ ٨٣

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يسٓ ﴿١﴾ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّكَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٣﴾ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤﴾ تَنزِيلَ ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٥﴾ لِتُنذِرَ قَوۡمٗا مَّآ أُنذِرَ ءَابَآؤُهُمۡ فَهُمۡ غَٰفِلُونَ ﴿٦﴾ لَقَدۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَىٰٓ أَكۡثَرِهِمۡ فَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٧﴾ إِنَّا جَعَلۡنَا فِيٓ أَعۡنَٰقِهِمۡ أَغۡلَٰلٗا فَهِيَ إِلَى ٱلۡأَذۡقَانِ فَهُم مُّقۡمَحُونَ ﴿٨﴾ وَجَعَلۡنَا مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ سَدّٗا وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ سَدّٗا فَأَغۡشَيۡنَٰهُمۡ فَهُمۡ لَا يُبۡصِرُونَ ﴿٩﴾ وَسَوَآءٌ عَلَيۡهِمۡ ءَأَنذَرۡتَهُمۡ أَمۡ لَمۡ تُنذِرۡهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿١٠﴾ إِنَّمَا تُنذِرُ مَنِ ٱتَّبَعَ ٱلذِّكۡرَ وَخَشِيَ ٱلرَّحۡمَٰنَ بِٱلۡغَيۡبِۖ فَبَشِّرۡهُ بِمَغۡفِرَةٖ وَأَجۡرٖ كَرِيمٍ ﴿١١﴾ إِنَّا نَحۡنُ نُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَنَكۡتُبُ مَا قَدَّمُواْ وَءَاثَٰرَهُمۡۚ وَكُلَّ شَيۡءٍ أَحۡصَيۡنَٰهُ فِيٓ إِمَامٖ مُّبِينٖ ﴿١٢﴾

(٩) جا لە بەردەمیانەوەو لە پشتیانەوە بەرپەرچێکی گەورەمان داناوە کە توانای دەرچونیان نەبێت ئەوسا ڕەشاویشمان هێناوە بەسەرچاویاندا و حەق نابینن.

(١٠) جا لەلای ئەوان یەکسانە چ بیانترسێنیتو چ نەیانترسێنیت ئەوان هەرباوەڕ ناهێننو گوێ لە حەق ناگرن.

(١١) ترساندنت تەنها بۆ کەسێکە کە پەیڕەوی لەم قورئانە بکاتو لە پەنامەکیدا لە ڕەحمان بترسێت، جا بەو کەسە موژدەی لێبوردنو پاداشتی چاکیش بدە. لەڕاستیدا ترساندن بۆ هەمو مرۆڤە بەڵام هەر خواناسان سوودی لێوەرئەگرن بۆیە ئاوا دەفەرموێ.

(١٢) بێگومان ئێمە تەواوی مردووان زیندوو دەکەینەوە بۆلێپرسینەوە و ئەوەی کە لە پێشەوە کردویانە لە دنیاداو ئەوەی کە پاش خۆیان پەیڕەوی لێوەدەکرێت لە چاكو خراپ بۆیان دەنوسینو هەمو شتێکمان لە پەڕاوی ڕۆشنکەرەوەدا کە (لوح المحفوظ)ە بە ژماردن دیاری کردووە هیچ شتێك ون نابێت.

لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە تیرەی بەنی سەلیمە دووری مزگەوتبونو ویستیان بێن لە نزیکی مزگەوتەوە ماڵ دروست بکەنو ئەو بڕیارەیان گەیشتە پێغەمبەر ﷺ جاپێی فەرمون: {يَا بَنِي سَلِمَةَ دِيَارَكُم تُكتَبْ آثَارُكُمْ، دِيَارَكُمْ تُكتَب آثَارُكُمْ/ ئەی بەنی سەلیمە لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە ئەو هاتوچۆتانە بۆ

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلًا أَصۡحَٰبَ ٱلۡقَرۡيَةِ إِذۡ جَآءَهَا ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿١٣﴾ إِذۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمُ ٱثۡنَيۡنِ فَكَذَّبُوهُمَا فَعَزَّزۡنَا بِثَالِثٖ فَقَالُوٓاْ إِنَّآ إِلَيۡكُم مُّرۡسَلُونَ ﴿١٤﴾ قَالُواْ مَآ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا وَمَآ أَنزَلَ ٱلرَّحۡمَٰنُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا تَكۡذِبُونَ ﴿١٥﴾ قَالُواْ رَبُّنَا يَعۡلَمُ إِنَّآ إِلَيۡكُمۡ لَمُرۡسَلُونَ ﴿١٦﴾ وَمَا عَلَيۡنَآ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا تَطَيَّرۡنَا بِكُمۡۖ لَئِن لَّمۡ تَنتَهُواْ لَنَرۡجُمَنَّكُمۡ وَلَيَمَسَّنَّكُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٨﴾ قَالُواْ طَٰٓئِرُكُم مَّعَكُمۡۚ أَئِن ذُكِّرۡتُمۚ بَلۡ أَنتُمۡ قَوۡمٞ مُّسۡرِفُونَ ﴿١٩﴾ وَجَآءَ مِنۡ أَقۡصَا ٱلۡمَدِينَةِ رَجُلٞ يَسۡعَىٰ قَالَ يَٰقَوۡمِ ٱتَّبِعُواْ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٢٠﴾ ٱتَّبِعُواْ مَن لَّا يَسۡـَٔلُكُمۡ أَجۡرٗا وَهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا لِيَ لَآ أَعۡبُدُ ٱلَّذِي فَطَرَنِي وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٢٢﴾ ءَأَتَّخِذُ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً إِن يُرِدۡنِ ٱلرَّحۡمَٰنُ بِضُرّٖ لَّا تُغۡنِ عَنِّي شَفَٰعَتُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا يُنقِذُونِ ﴿٢٣﴾ إِنِّيٓ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٤﴾ إِنِّيٓ ءَامَنتُ بِرَبِّكُمۡ فَٱسۡمَعُونِ ﴿٢٥﴾ قِيلَ ٱدۡخُلِ ٱلۡجَنَّةَۖ قَالَ يَٰلَيۡتَ قَوۡمِي يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ ٱلۡمُكۡرَمِينَ ﴿٢٧﴾

دەنوسرێت، لە ماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە ئەو هاتوچۆتانە بۆ دەنوسرێت} جا وشەی (آثار) چ ئەوە بێت کە لەپاش خۆیان خەڵکی لەسەر بڕوات وەکو مانامان کرد یان ئەو هاتوچۆیە بۆ بەندایەتی بێ یان بۆتاوان هیچ جیاوازی نیەو هەردووك دەنوسرێت بۆ مرۆڤ.

(١٣) ئەی محمد ﷺ باس بکە بە نمونە بۆ گەلەکەت خەڵکی ئەو ئاواییەی(ئەنتاکیە) کە کاتێك کە نێرداوەکان هاتنە لایان.

(١٤) سەرەتا باسکە ئەو کاتەی کە دوو نێردراومان نارده لایانو ئەوانیش بە درۆیان خستنەوە ئەوسا ئەوانمان بە یەکێکی تر بەهێز کرد کە بوون بە سێ کەس بۆ ئەوەی یارمەتی ئەو دووانەیان بدات، جا وتیان: بێگومان ئێمە بۆ لای ئێوە ڕەوانە کراوین کە بەندایەتی اللّٰه بکەنو هاوبەشی بۆ دانەنێن.

(١٥) وتیان: ئێوەش هەر مرۆڤێکن وەکو ئێمەو ڕەحمان هیچ شتێکی نەناردوەو ئێوە هەر درۆ دەکەن.

(١٦) وتیان: پەروەردگارمان دەزانێت کە بێگومان ئێمە بۆ لای ئێوە ڕەوانە کراوین.

(١٧) خۆ ئێمە هەر گەیاندنی ڕوونمان لەسەرەو ئێوە خۆتان بەرپرسن لە ڕەفتارو قسەی خۆتان.

(١٨) وتیان: ئێمە نەگبەتیو ڕۆژ ڕەشی خۆمان لە ئێوەی دەزانین ئەگەر واز لەم ڕاگەیاندنە نەهێنن بەڕاستی سەنگسارتان دەکەینو لە ئێمەوە سزایەکی دەردناکتان پێدەگات.

(١٩) نێردراوەکان وتیان: نەگبەتیتان بەهۆی خراپی خۆتانەوەیە ئایا ئەگەر ئێوە ئامۆژگاری بکرێن هەروا دەبن؟ بەڵکو ئێوە گەلێکن لە سنور تێپەڕیون.

(٢٠) جا لەلای سەروی شارەکەوە پیاوێك بە پەلە هاتو وتی: ئەی گەلی من بە قسەی ئەو نێرراوانە باوەڕ بکەنو پەیڕەوییان بکەن.

(٢١) دوای کەسێك بکەون کە داوای هیچ مووچەو پاداشێکتان لێ ناکاتو ئەوان ڕێنمایی کراونو ئێوەش ڕێنمایی دەکەن بۆ ڕێگای ڕاستو دروست، ئینجا ئەو پیاوە بۆ ئەوەی زیاتر قسەکەی لەواندا کار بکات ڕوی قسەی دەکاتە خۆیو دەڵێ:

(٢٢) دەی ئەوە چیە کە من بەندایەتی ئەو زاتە ناکەم کە دروستی کردوومو گەڕانەوەی ئێوەش هەر بۆ لای ئەوە؟

(٢٣) ئایا جگە لەو من خودایانێکی تر بکەم بە خودای خۆم کە ئەگەر ڕەحمان ئارەزۆی زیانێك بکات بۆم ئەو کاتە تکای ئەوان بۆ من بەکەڵکی هیچ نایەتو لە سزای اللّٰه ڕزگارم ناکات.

(٢٤) جا بێگومان من ئەو کاتە بە ئاشکرا سەر لێشێواوم.

(٢٥) بێگومان من باوەڕم هێناوە بە پەروەردگارتان، سا گوێتان لێ بێت، بەڵێ ئەو پیاوە پاش ئەو بانگەوازەی کافرانی خزمی هێرشیان بۆ کردو شەهیدیان کرد، جا اللّٰه خستیە ناو بەهەشتی خۆیەوەو بە زمانی ئەویش بە گەلەکەیو بە ئێمەی ڕاگەیاند کە،

(٢٦) پێی وترا: بچۆرە بەهەشتەوە، ئەویش وتی: ئای خۆزگە خزمانم بەم دەستکەوتە بەنرخەی منیان بزانیایە.

(٢٧) بەوەی کە پەروەردگارم بەخشیومیو لەنێو بەڕێزەکاندا دایناوم. دەڵێن: ئەو پیاوە ناوی (حەبیبی نەجار) بوە. ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٢٨) جا ئێمە پاش ئەوە هیچ یەك لە سەربازەکانمان لە ئاسمانەوە نەنارده سەریان کە تۆڵەیان لێوەرگرنەوەو ئەوەیشمان لەگەڵ هیچ کەسێکی تردا نەکردوە کە فریشتە بنێرین بۆ تۆڵە سەندنەوە، تەنها بۆ تۆیە ئەی محمد ﷺ کە فریشتە دەنێرین بۆ یارمەتیدانت. ئەی ئەوان چییان لێ کرا؟

۞ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنۢ بَعۡدِهِۦ مِن جُندٖ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا كُنَّا مُنزِلِينَ ﴿٢٨﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ خَٰمِدُونَ ﴿٢٩﴾ يَٰحَسۡرَةً عَلَى ٱلۡعِبَادِۚ مَا يَأۡتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُواْ بِهِۦ يَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٣٠﴾ أَلَمۡ يَرَوۡاْ كَمۡ أَهۡلَكۡنَا قَبۡلَهُم مِّنَ ٱلۡقُرُونِ أَنَّهُمۡ إِلَيۡهِمۡ لَا يَرۡجِعُونَ ﴿٣١﴾ وَإِن كُلّٞ لَّمَّا جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٣٢﴾ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلۡأَرۡضُ ٱلۡمَيۡتَةُ أَحۡيَيۡنَٰهَا وَأَخۡرَجۡنَا مِنۡهَا حَبّٗا فَمِنۡهُ يَأۡكُلُونَ ﴿٣٣﴾ وَجَعَلۡنَا فِيهَا جَنَّٰتٖ مِّن نَّخِيلٖ وَأَعۡنَٰبٖ وَفَجَّرۡنَا فِيهَا مِنَ ٱلۡعُيُونِ ﴿٣٤﴾ لِيَأۡكُلُواْ مِن ثَمَرِهِۦ وَمَا عَمِلَتۡهُ أَيۡدِيهِمۡۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٣٥﴾ سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَزۡوَٰجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنۢبِتُ ٱلۡأَرۡضُ وَمِنۡ أَنفُسِهِمۡ وَمِمَّا لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٣٦﴾ وَءَايَةٞ لَّهُمُ ٱلَّيۡلُ نَسۡلَخُ مِنۡهُ ٱلنَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظۡلِمُونَ ﴿٣٧﴾ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ﴿٣٩﴾ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ﴿٤٠﴾

(٢٩) بۆ ئەوان تەنها یەك نرکەو هاوار بوە ئیتر ئەو كاتە هەموویان چەنو مل کەوتونو لەناو براون.

(٣٠) وای بۆ ئەو بەندانە چیان کرد بە خۆیان هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتوە مەگەر ئەوان گاڵتەیان پێ کرد بێت.

(٣١) ئایا ئەم خەڵکەی کە باوەڕ بە تۆ ناکەن ئەی محمد ﷺ نەیانبینوە کە ئێمە چەندین پێرو تاقممان پێش ئەوان لەناو برد کە ئەوان تازە ناگەڕێنەوە بۆ لایانو بۆ ناو ماڵو خزمو کەس‌وکاریان.

(٣٢) بێگومان هەموویشیان هەر لەلای خۆمان ئامادە دەکەین بۆ لێپرسینەوەو پاداشت و سزا.

(٣٣) جا بەڵگەیەکی گرنگ هەیە بۆ ئەوان لەسەر دەسەڵاتی ﷲ بۆ زیندووکردنەوەیان ئەویش ئەم زەویە مردوە وشكو بێ گژوگیایە کەزیندومان کردەوە بە ئاوو دانەوێڵەی وەك گەنمو جۆو برنجو شتانی تریشمان لەو زەویە دەرهێناوە کە خۆیانو مەڕو ماڵاتیان لەو دەخۆنو سوودی لێ وەردەگرن.

(٣٤) خۆ لەناو ئەم زەویدا باخاتمان بۆ ڕواندون لە خورماو لە ترێ و چاوگە گەلێکی ئاویشمان بۆ هەڵقوڵاندون بۆ خواردنەوەی خۆیانو مەڕوماڵەتیانو ئاودانی کشتوکاڵو شینایيەکانیان.

(٣٥) تا بەروبوومی میوە باسکراوەکان بخۆن، وە لە بەروبوومی ئەوەش کە بەدەستی خۆیان ڕواندویانە ئایا ئەوان سوپاسی بەدیهێنەری ئەم فەرو خەیرە ناکەن؟ واتە با سپڵە نەبنو ئەو هەمو چاکانەیان لەبیر نەچێتەوەوسوپاسی بکەن.

(٣٦) پاكو بێگەردی بۆ ئەو زاتەی کە بە جووت (نێرو مێ) هەمو شتێکی دروستکردوە لەوانەی کە زەوی سەوزی دەکاو لە خۆیشیانو لەوانەیش کە نایزانن، تەنانەت لە ئاسنو بەردیشدا نێرو مێی داناوە.

(٣٧) جا بەڵگەیەکی تر لەسەر دەسەڵاتو هێزی ﷲ لەسەر زیندووکرنەوەو حیسابو بەهەشتو دۆزەخ ئەو شەوەیە کە هەمیشە لەبەر چاویاندایە کە ڕۆژی لێ دادەڕنین، ئەوسا ئەوان لەناو تاریکیدان، کێ ئەم گۆڕانکارییەدەکات؟ جا بۆ بیری لێ ناکەنەوە؟

(٣٨) جا بەڵگەیەکی تر لەسەر دەسەڵاتی پەروەردگار لەسەر زیندوو کردنەوە ئەو خۆرەیە کە دەڕوات بۆ جێگای ئارامگرتنی، ئەو هاتوچۆیەش ئەندازە گیراوو دیاریکردنێکە لەلایەن زاتێکی دەسەڵاتداری زاناوە کە(ﷲ)یە.

(٣٩) وە یەکێکی تر لە بەڵگەی دەسەڵاتی پەروەردگار لەسەر زیندو کردنەوە ئەم مانگەیە کە چەند قۆناغێکمان بۆ داناوە (کە بیستو هەشت قۆناغە لە بیستو هەشت شەوداو دوو شەو لەبەرچاوی ئێمە گوم دەبێت ئەگەر مانگ سی تەواو بێتو یەك شەو ون دەبێت، ئەگەر مانگ بیستو نۆ ڕۆژ بێت) هەتا لە ئاخر قۆناغدا ئەم مانگەی ئاسمان وەکو لقی هێشوی کۆنی خورما، زەرد ڕەنگو چەماوەو لاواز دەبێت.

(٤٠) جا نە خۆر بۆی هەیە لە شەودا لەگەل مانگدا کۆ ببێتەوەو نە بۆ شەویش هەیە پێشی ڕۆژ بکەوێتو پێش ئەوەی کە کاتی خۆی تەواو ببێت بدات بەسەر ڕۆژداو هەموویان لەناو بۆشایی نێوان ئاسمانو زەویدا بەو شێوەی کە بۆیان دیاریکراوەبەبێ ئەوەی کە سنور بشکێنن مەلەوانی دەکەن.واتە وەك مەلەوانی ناودەریا بێپسانەوە دێن‌ودەچن.

(٤١) جا بەڵگەیەکی گەورەو گرنگتر لەسەر دەسەڵاتو هێزی ﷲ ئەوەیە کە بەڕاستی ئێمە لە سەردەمی نوح(عليه السلام)دا باو باپیرانی ئەوانمان لەناو کەشتیەکی پڕدا هەڵگرت، چونکە پاش نوح (عليه السلام) هەمو خەڵك لە نەوەی ئەون کەوا بو ڕزگار بونی ئەوان منەتێکی گەورەی (ﷲ) یە بەسەر هەمو خەڵکەوە، چونکە ئەگەر ئەوان

وَءَايَةٞ لَّهُمۡ أَنَّا حَمَلۡنَا ذُرِّيَّتَهُمۡ فِي ٱلۡفُلۡكِ ٱلۡمَشۡحُونِ ﴿٤١﴾ وَخَلَقۡنَا لَهُم مِّن مِّثۡلِهِۦ مَا يَرۡكَبُونَ ﴿٤٢﴾ وَإِن نَّشَأۡ نُغۡرِقۡهُمۡ فَلَا صَرِيخَ لَهُمۡ وَلَا هُمۡ يُنقَذُونَ ﴿٤٣﴾ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّقُواْ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيكُمۡ وَمَا خَلۡفَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ﴿٤٥﴾ وَمَا تَأۡتِيهِم مِّنۡ ءَايَةٖ مِّنۡ ءَايَٰتِ رَبِّهِمۡ إِلَّا كَانُواْ عَنۡهَا مُعۡرِضِينَ ﴿٤٦﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنُطۡعِمُ مَن لَّوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ أَطۡعَمَهُۥٓ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٤٧﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلۡوَعۡدُ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٤٨﴾ مَا يَنظُرُونَ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ تَأۡخُذُهُمۡ وَهُمۡ يَخِصِّمُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَا يَسۡتَطِيعُونَ تَوۡصِيَةٗ وَلَآ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٥٠﴾ وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَإِذَا هُم مِّنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يَنسِلُونَ ﴿٥١﴾ قَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا مَنۢ بَعَثَنَا مِن مَّرۡقَدِنَاۜۗ هَٰذَا مَا وَعَدَ ٱلرَّحۡمَٰنُ وَصَدَقَ ٱلۡمُرۡسَلُونَ ﴿٥٢﴾ إِن كَانَتۡ إِلَّا صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَإِذَا هُمۡ جَمِيعٞ لَّدَيۡنَا مُحۡضَرُونَ ﴿٥٣﴾ فَٱلۡيَوۡمَ لَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗا وَلَا تُجۡزَوۡنَ إِلَّا مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٥٤﴾

رزگار نەبونایە هەر ئەو کاتە مرۆڤ کۆتایی پێدەهات. وشەی ﴿ ذُرِّيَّةٌ ﴾ هەم بە مانای نەوەکان و هەم بە مانای باوکانیش بەکاردێت.

(٤٢) خۆ وێنەی ئەو کەشتیەشمان بۆ ئەوان دروستکرد ئەوەی کە سواری دەبن وەك تەیارەوسەیارە کەبەم لاو ئەولادا دەڕۆن‌و کەیفو سەیرانی خۆیانی لێ دەکەن‌و بژێوی خۆیانی پێدابین دەکەن. سەرچاوەی ئەمانە هەموی ژیرییەکەنیعمەتێکی گەورەی الله یە.

(٤٣) جا ئەگەر ئێمە حەز بکەین لەناو دەریادا نغرۆیان دەکەین، ئەوسا هیچکەس بەدەمیانەوە نایەت‌و ئەوان ڕزگار ناکرێن.واتە با بە هەمیشەیی ترسی خوا لەدڵیاندا بێ‌وڵێی بێ ئاگا نەبن.

(٤٤) بەڵام ئێمە بە بەزەیی خۆمان دەیانپارێزین‌و شادی‌و خۆشیان پێدەدەین هەتا کاتی دیاریکراوی لای الله ئەو کاتە ئیتر دەبێت بمرن‌و بچن بۆ دنیایەکی تر بۆ بگرەو بەردەو پاداشت‌و سزا.

(٤٥) جا هەر کاتێك پێیان بوترێت بترسن لەو ڕوداوانەی کە ڕویداوە بۆ گەلانی پێش ئێوەو ئەوەی کە لە دوارۆژدا یەختان دەگرێت بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت، بەداخەوە ئەوان گوێیان بەوە نەدا.

(٤٦) خۆ هیچ بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی پەروەردگاریان نەهاتوەتە لا مەگەر ئەوان پشتیان تێکردبێ‌و گوێیان بە هیچ نیشانەیەك نەدابێ. کە ئەمەش ڕەوشتی هەمیشەیی کافرو بێباوەڕانە.

(٤٧) جا هەر کاتێکیش بەوان بوترێت: لەوەی کە الله پێیداون ببەخشن بە فەقیران، خوانەناسان بە باوەڕداران دەڵێن: ئایا ئێمە خواردن بدەین بە کەسێك کە ئەگەرالله خۆی حەزبکات خواردنی پێ دەدات. جا دەیان ویست کە بەو شێوەیە دەستگرتنەوەی خۆیان لەچاکە بە شتێکی ئایینی‌و پەسەند لەقەڵەم بدەن چونکە دەیان ویست بڵێن: کەسێك کە خوا خواردنی لێ بگرێتەوەو کەمدەستی بکات چۆن دەبێت ئێمە خواردنی پێبدەین‌و دژایەتی الله بکەین؟! هەروەك دەیان وت: ئەوەی کە خۆمان سەری بڕین حەڵاڵە ئەی ئەوەی خوا سەری ببڕێت (مردارۆبوو) چۆن دەبێت حەلاڵ نەبێت؟ ئیتر ئەو هەمو ئایەتەی (الله)و فەرمودەی پێغەمبەرەکەیان ﷺ دەخستە پشتگوێ، لێرەشالله بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ: بەڕاستی ئێوە هەر لە گومڕاییەکی ناقوڵای ئاشکرادان.

(٤٨) جا دەڵێن: ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن ئەو بەڵێنە کەی دێت کە ئێمە بمرین‌و زیندو بکرێینەوە؟ جاخوا دەفەرموێ:

(٤٩) ئەوانە چاوەڕێ ناکەن مەگەر پەیدابونی یەك دەنگ کە کاتێك خەریکی بگرەو بەردەی ناو خۆیانن دەیانگرێت‌و لەم جیهانەوە دەیان بات بۆ جیهانێکی تر،

(٥٠) ئەوسا ئەوان توانای وەسیەتکردنیان نابێت‌و ئیتر بۆ لای خاوخێزانی خۆیشیان ناگەڕێنەوە.

(٥١) خۆ هەر فوو بە کەڵەشاخدا کرا ئەوسا ئەوان کتوپڕ بە ڕووت‌و قووتی‌و بەپێخاوسی لەناو گۆڕەکانیاندا دێنە دەرەوەو بەرەو گۆڕەپانی مەحشەرو دادگای پەروەردگاری خۆیان بەترس‌ولەرزەوە دەکەونە ڕێ. جا ئەوەی کە باوەڕیان پێی نەبوە بەچاوی خۆیان دەیبینن.

(٥٢) جا ئەڵێن: هاوار بۆ ئێمە کێ لەم جێگای خەومانەدا خەبەری کردینەوە؟! ئەمە ئەوەبو کە ڕەحمان بەڵێنی هاتنی دابوو پێغەمبەرانیش (سەلامی خوایان لەسەر بێت) ڕاستیان کرد. بەڵێ: نەزانان‌و هەڵخەڵەتێنراوان لەوێدا دان بە هەمو ڕاستیەکاندا دەنێن بەڵام هیچ سوودێکیان پێنادات.

(٥٣) ئەو ڕووداوو کارەساتانەش تەنها یەك دەنگە جا ئیتر کتوپڕ هەمویان لەلای ئێمە ئامادە دەکرێن بۆ لێپرسینەوە.

﴿٥٤﴾ ئەوسا لەو ڕۆژەدا هیچ کەسێك ستەمی لێ ناکرێتو پاداشتیش نادرێنەوە مەگەر بەگوێرەی ئەو شتەی کە کردویانە.

﴿٥٥﴾ بێگومان ئەوانەی کە بەهەشتین لەم ڕۆژەدا سەرگەرمی خۆشگوزەرانینو ڕادەبوێرن.

﴿٥٦﴾ خۆیانو هاوسەرەکانیشیان لەناو سێبەرەکاندان لە سەر تەختەکانن و بەخۆشیەوە شانیان داناوە.

﴿٥٧﴾ بۆ ئەوان هەیە لەو بەهەشتەدا میوەی چاك، وە بۆیان هەیە هەرچیش داوابکەن.

﴿٥٨﴾ لە پەروەردگاری بەسۆزەوە بە قسە سەلامیان لێدەکرێت. ئەوەیە سەرەنجامی باوەڕداران. بەڵام بە تاوانباران دەوترێت:

﴿٥٩﴾ ئەمڕۆ ئەی تاوانباران جیاببنەوە، پاداشتی ئێوە نەفرینو سزای دۆزەخو ڕقو قینی (ﷲ)یە.

﴿٦٠﴾ ئەی نەوەی ئادەم ئەی من لە پێشەوە پەیمانم لەگەڵ نەبەستن کە شەیتان نەپەرستن کە بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ڕوونە بۆ ئێوەو سوێندی خواردوە کە هەموتان جگە لە بەندە چاکەکان لە ڕێ بترازێنێتو بتان خاتە ناودۆزەخەوە، دەی بۆ ئێوە ئاواخۆتان دایە دەستی؟!

﴿٦١﴾ خۆ پێیشم وتن: کە بەندایەتی ڕاستو دروست بۆ من بکەن کەئەمەیە ڕێگای ڕاست؟

﴿٦٢﴾ بەڕاستی ئەو خەڵکانێکی زۆری لە ئێوە گومڕاو سەرلێشێواو کرد ئایا ئێوە هەر فام ناکە نەوەو ژیر نابن کە دۆستو دوژمنی خۆتان بناسنو چاكو خراپ لەیەك جیابکەنەوە، جا لەو ڕۆژەدا پێیان دەوترێت:

﴿٦٣﴾ ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە بەڵێنتان پێدەدرا.

﴿٦٤﴾ جا بەهۆی ئەوەی کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد ئەمڕۆ بچنە ناویەوە، ئینجا خوانەناسان دەکەونە بەهانە هێنانەوەو درۆکردنو دەیانەوێت خۆیان دەرباز بکەن لە دۆزەخ، بەڵام ئەوە لەوێدا بە دەردیان ناخوات چونکە ﷲ بەتوندی تێیان دەخوڕێتو دەفەرموێ:

﴿٦٥﴾ ئەمڕۆ دەمیان لە گۆ دەخەینو مۆری پێدادەنێینو دەستەکانیان و پێیەکانیان قسەمان لەگەڵدا دەکەنو شایەتی دەدەن لەسەر تاوانو خراپەکارییەکانیان بەهۆی ئەو کارە خراپانەی کە کردویانە، بەڵێ هەمو پارچەکانی لەشی مرۆڤ لەو کاتەدا دێتە قسەو هەرچی لەگەڵ کراوەو چی پێ ئەنجامدراوە

إِنَّ أَصۡحَٰبَ ٱلۡجَنَّةِ ٱلۡيَوۡمَ فِي شُغُلٖ فَٰكِهُونَ ﴿٥٥﴾ هُمۡ وَأَزۡوَٰجُهُمۡ فِي ظِلَٰلٍ عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ مُتَّكِـُٔونَ ﴿٥٦﴾ لَهُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَلَهُم مَّا يَدَّعُونَ ﴿٥٧﴾ سَلَٰمٞ قَوۡلٗا مِّن رَّبّٖ رَّحِيمٖ ﴿٥٨﴾ وَٱمۡتَٰزُواْ ٱلۡيَوۡمَ أَيُّهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٥٩﴾ ۞ أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوّٞ مُّبِينٞ ﴿٦٠﴾ وَأَنِ ٱعۡبُدُونِيۚ هَٰذَا صِرَٰطٞ مُّسۡتَقِيمٞ ﴿٦١﴾ وَلَقَدۡ أَضَلَّ مِنكُمۡ جِبِلّٗا كَثِيرًاۖ أَفَلَمۡ تَكُونُواْ تَعۡقِلُونَ ﴿٦٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱصۡلَوۡهَا ٱلۡيَوۡمَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ﴿٦٤﴾ ٱلۡيَوۡمَ نَخۡتِمُ عَلَىٰٓ أَفۡوَٰهِهِمۡ وَتُكَلِّمُنَآ أَيۡدِيهِمۡ وَتَشۡهَدُ أَرۡجُلُهُم بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٦٥﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَطَمَسۡنَا عَلَىٰٓ أَعۡيُنِهِمۡ فَٱسۡتَبَقُواْ ٱلصِّرَٰطَ فَأَنَّىٰ يُبۡصِرُونَ ﴿٦٦﴾ وَلَوۡ نَشَآءُ لَمَسَخۡنَٰهُمۡ عَلَىٰ مَكَانَتِهِمۡ فَمَا ٱسۡتَطَٰعُواْ مُضِيّٗا وَلَا يَرۡجِعُونَ ﴿٦٧﴾ وَمَن نُّعَمِّرۡهُ نُنَكِّسۡهُ فِي ٱلۡخَلۡقِۚ أَفَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٦٨﴾ وَمَا عَلَّمۡنَٰهُ ٱلشِّعۡرَ وَمَا يَنۢبَغِي لَهُۥٓۚ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ وَقُرۡءَانٞ مُّبِينٞ ﴿٦٩﴾ لِّيُنذِرَ مَن كَانَ حَيّٗا وَيَحِقَّ ٱلۡقَوۡلُ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧٠﴾

دەیڵێت: تەنانەت ئەژنۆی چەپی پێش، هەمو شت دێتە قسە. جا پاش ئەوەی کە سەفەرێکی ئەو دنیای پێکردین دیسانﷲ دێتەوە سەر باسی ئەم ژیانەو مرۆڤ لە دەسەڵاتو هێزی خۆی دەترسێنێت، بەڵکو بیر بکاتەوەو دوچاری ئەو ڕۆژە ڕەشە نەبێتو دەفەرموێ:

﴿٦٦﴾ خۆ ئەگەر حەزمان لێ بێت چاویان کوێر دەکەین، ئەوسا کێبەرکێ دەکەن بۆ ڕێگا جا چۆن دەبینن، واتە: ئەو کاتە کوێرنو هیچ شتێك نابینن.

﴿٦٧﴾ جا ئەگەر حەزیش بکەین هەر لەو پلەو مەقامو شوێنەی خۆیاندا دەیانگۆڕین بەدارو بەردو جانەورانی تر، جا ئەو کاتە توانای ڕۆیشتنیان نیەو نایشگەڕێنەوە نە بۆشێوەی پێشوی خۆیانو نە بۆ ناو خاوخێزانی خۆیان. دەی ئیتر بۆچی دەبێت نافرمانی بکەنو گوێ بە پێغەمبەرکەیان ﷺنەدەن؟!

﴿٦٨﴾ جا هەر کەسێکی کە تەمەنی درێژ بکەین لە ئەسڵی ساختمانی لەشی کەم دەکەینەوە وەکو توش بوون بە کوێریو کەڕیو کەم عەقڵیو نخۆشیو لاوازیو دەیان عەیبی تر، دەی ئایا ژیری ناخنە کارەوە بۆئەوەی لەم ڕاستیە تێبگەن و بزانن کە ئەو زاتەی کە ئەوان والێدەکات دەتوانێت لەپاش مردنیش زیندویان بکاتەوە؟

أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا خَلَقۡنَا لَهُم مِّمَّا عَمِلَتۡ أَيۡدِينَآ أَنۡعَٰمٗا فَهُمۡ لَهَا مَٰلِكُونَ ﴿٧١﴾ وَذَلَّلۡنَٰهَا لَهُمۡ فَمِنۡهَا رَكُوبُهُمۡ وَمِنۡهَا يَأۡكُلُونَ ﴿٧٢﴾ وَلَهُمۡ فِيهَا مَنَٰفِعُ وَمَشَارِبُۚ أَفَلَا يَشۡكُرُونَ ﴿٧٣﴾ وَٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةٗ لَّعَلَّهُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يَسۡتَطِيعُونَ نَصۡرَهُمۡ وَهُمۡ لَهُمۡ جُندٞ مُّحۡضَرُونَ ﴿٧٥﴾ فَلَا يَحۡزُنكَ قَوۡلُهُمۡۘ إِنَّا نَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَ ﴿٧٦﴾ أَوَلَمۡ يَرَ ٱلۡإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقۡنَٰهُ مِن نُّطۡفَةٖ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٞ مُّبِينٞ ﴿٧٧﴾ وَضَرَبَ لَنَا مَثَلٗا وَنَسِيَ خَلۡقَهُۥۖ قَالَ مَن يُحۡيِ ٱلۡعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٞ ﴿٧٨﴾ قُلۡ يُحۡيِيهَا ٱلَّذِيٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٖۖ وَهُوَ بِكُلِّ خَلۡقٍ عَلِيمٌ ﴿٧٩﴾ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ ٱلشَّجَرِ ٱلۡأَخۡضَرِ نَارٗا فَإِذَآ أَنتُم مِّنۡهُ تُوقِدُونَ ﴿٨٠﴾ أَوَلَيۡسَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يَخۡلُقَ مِثۡلَهُمۚ بَلَىٰ وَهُوَ ٱلۡخَلَّٰقُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٨١﴾ إِنَّمَآ أَمۡرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيۡـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ فَسُبۡحَٰنَ ٱلَّذِي بِيَدِهِۦ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيۡءٖ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٨٣﴾

سُورَةُ الصَّافَّاتِ ٣٧ ١٨٢

﴿٦٩﴾ وه ئێمه ئەو پێغەمبەرەمان فێری شیعر نەکرد بو هیچ پێویستیەکیشی بەو نیەو نا بێ شیعریش بلێ، ئەم قورئانە جگە لە ئامۆژگاریو خوێندنەوەیەکی بەرێزو روون شتێکی تر نیە.

﴿٧٠﴾ تا بە سزای پاشەرۆژ بترسێنێت ئەو کەسانەی کە زیندون کە باوەرداراننو تا ئەو بریارەی (ﷲ) یش کە داویەتی بۆ سزادانی بێباوەران بێتەدی. بەراستی ئەوان وەکو مردو وان لەوەی کە لە هیچ تێناگەنو بۆ شتێکی زۆر کەمو دواهاتوو ژیانێکی هەمیشەیی لەخۆیان زایە دەکەن.

﴿٧١﴾ ئایا هەروەها درێژە بە خوانەناسی خۆیان دەدەنو نابیننو نازانن کە هەندێك لەوانەی کە بەدەستی خۆمان کردومانن کە مەرو بزنو وشترو گایە ئێمە بۆ ئەوانمان دروستکردوە، ئەوسا ئەوان خاوەنیاننو سودیان لێ وەر دەگرن؟

﴿٧٢﴾ جا ئەوانمان رامو دەستەمۆ کردوە بۆیان جا هەندێکیان بۆ سواری سودیان لێ وەردەگرنو لە هەندێکیشیان دەخۆن. بەراستی ئەگەر پەروەردگار ئەسپ یان وشتری رام نەکردایە مرۆڤ نەیدەتوانی سودیان لێ وەرگرێت، مرۆڤ ناتوانێت بێ ترس لەگەڵ پلنگێك یان ورچێکدا هەڵسوکەوت بکات کە زۆر بچوکترن لە ئەسپو وشتر چونکە ﷲ ئەوانی رام نەکردوە بۆ سودی مرۆڤ، جا ژیربنو وردببنەوە.

﴿٧٣﴾ جا لەو مەرو ماڵاتە سوودێکی زۆر وەردەگرن وخواردنەوە گەلێکی هەمە جۆرە لە شیرو ماستو کەرەو پەنیرو خوریومووو وپێست، تەنانەت لە میزی هە ندێکیان بۆ چارەسەری هەندێك نخۆشی. دەی ئایا ئەوان سوپاسی پەروەردگاری خۆیان ناکەن؟ واتە: پێویستە لەسەریان سوپاسگوزار بنو سپڵەونمەك نەناس نەبن.

﴿٧٤﴾ خۆئەوان جگە لە ﷲ خودایانێکی تر دەکەن بە خوای خۆیان تا بەڵکو یارمەتی بدرێن!

﴿٧٥﴾ لەحاڵێکدا ئەوانە ناتوانن یارمەتیان بدەن بەڵکو ئەوان سەربازانێکی گوێ لەمشتو ئامادەکراون بۆ خوا بێ دەسەڵاتەکانیانو پاسەوانیان دەکەنو لە دوژمن دەیان پارێزن کەچی ئەو خوا گەلە هیچ چاکەیەکیان نیە بۆئەوانوناشتوانن هیچ خراپەیەکیان لەسەر لابەن.﴿ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلۡمَطۡلُوبُ﴾ /حج: ٧٣ / لاوازە بەندایەتی کەرو بەندایەتی بۆکراو﴾

﴿٧٦﴾ جا باتۆ خەفەتبار نەکات قسەکانیان کە باوەرت پێناکەنو تانەو تەشەرت لێ دەدەنو باوەر بە ﷲ ناکەن بێگومان ئێمە ئەوەی کە دەیشارنەوەو ئەوەیش کە ئاشکرای دەکەن دەیزانین، جا تۆڵەی خراپەکانیان بە دادپەروەرانە لێدەسێنین، سا تۆ ئەی محمد ﷺ ئیتر ئارامبەو بەرنامەی خۆت رابگەیەنەو خەفەت مەخۆ.

﴿٧٧﴾ ئایا مرۆڤ هەر وا لوت بەرزەو بیر لە خۆی ناکاتەوەو نازانێت کە ئێمە لە دلۆپەیەك تۆی نێرو مێ دروستمانکردوە کەچی ئەو وا ئێستا دوژمنێکی ئاشکرای ئێمەیە؟!

﴿٧٨﴾ جا بۆ ئێمە نمونە دەهێنێتەوەو دروستبونی خۆی لەبیرچوەتەوەو ئێسقانە بتورکایەك هەڵدەگرێتو دەڵێت: کێ ئەم ئێسقانەی کە بتورکاوە زیندوو دەکاتەوە؟ ﷲ بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

﴿٧٩﴾ بلێ: ئەو کەسەی کە سەرەتا لە هیچ دروستیکردوە هەر ئەوە زیندویشی دەکاتەوەو هەر خۆیەتی زانیاری هە یە بەسەر هەمو دروستکراوێکیدا بە کورتیو بە درێژیو لە پاشو لە پێش دروستکردنیدا، بێگومان کەزەوی ناتوانێت هچ بەشێك نە گەورەو نە بچوك لە لەشی دروستکراوەکانی ﷲ بشارێتەوەو رۆژی دوایی هەموی دەهێنێتەوە بۆ بەردەم دادگای ﷲ بۆ پرسیارو پاداشتو سزا بەڵکو دروستکردنەوەی دووهەم لە دروستکردنی یەکەم ئاسانترە، جا بۆ دەبێت مرۆڤ بە چاکی بیر لەمە نەکاتەوەو پەروەردگاری خۆی نەناسێت؟! ئایا چاوی کوێرەو راستی نابینێت

یـان شـەیتان فریـوی داوە؟ بـەڵێ لای ﷲ هـەمو شـت ئاسـانە.

تێبینی: دەڵێن: عاسی کوڕی وائیل لەناو بەردەڵانەکانی مەکەدا ئێسقانێکی ڕزیوی هێناو بە پەنجەکانی وردی کردو، بە پێغەمبەر ﷺ وت: ئایا ﷲ ئەم ئێسکە پاش ئەوەی کە ئاوا بتورکاو ڕێزاڵ ڕێزاڵ بووە زیندوی دەکاتەوە؟! پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {نَعَم يُمِيتُكَ اللهُ ثُمَّ يُحيِيكَ ثُمَّ يدخِلُكَ جَهَنَّم/ بەڵێ: ﷲ دەتمرێنێتو زیندوت دەکاتەوە، پاشان دەتخاتە دۆزەخەوە} جا ئەم ئایەتانەی کۆتایی سورەتی یاسین بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەم خوانەناسە دابەزیون.

(٨٠) ئەو زاتە زیندوتان دەکاتەوە کە لەناو درەختی سەوزدا ئاگری داناوە بۆ ئێوە تا لە ماڵو لەسەفەردا سودی لێوەربگرن، ئەوەتە کە ئێوە لەو درەختە ئاگر ڕۆشن دەکەن، بەڵێ: بەراستی ئەو زاتە زاناو بەتوانایەی کە ئاگرو درەختی شینو ئاو بەیەکەوە کۆ دەکاتەوە نە ئاو ئاگرەکە دەکوژێنێتەوەو نە ئاگرەکە درەختەکە دەسوتێنێت، زۆر ئاسانە لەلای زیندو کردنەوەی گیانلەبەرانیش، جا ئەی مرۆڤ بیر بکەرەوەو خۆت بناسەو بەراستی بەندا یەتی پەروەردگارت بکەو خۆت گێل مەکە، چونکە بەگێلی بۆت ناچێتە سەر، هەرچی بکەیتو هەرچی ببیت هەردە بێ ڕۆژێك بێت کە دادگایی بکرێیت.

(٨١) ئایا ئەو زاتەی کە ئاسمانانو زەوی دروستکردوە توانایی ئەوەی نیە کە وێنەی ئەوان دروست بکاتەوە؟ بەڵێ، لە توانایدا هەیەو هەر خۆی دروستکەرو زانەرە بە هەمو شتێك.

(٨٢) بڕیاری ئەو هەرکاتێك کە بییەوێت شتێك بکات هەر ئەوەندەی پێدەچێت کەبفەرموێ: ببە. کوتوپڕ بەبێ دواکەوتن دەبێت.

(٨٣) سا پاکیو بێ عەیبی بۆ ئەو زاتەی کە هەمو شتێك بە دەست ئەوەو خاوەنی هەموشتێکەو هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێنرێنەوە بۆ بگرەو بەردەو پاداشتو سزا .

## ٣٧ سورەتی سافات ١٨٢

سورەتی سافات کە سورەتی سیو حەوتەمی قورئانە ، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، سەدوهەشتاو دوو ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاوشەشەمەو پاش سورەتی (الأنعام) وپێش (لقمان) دابەزیوە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بەوانەی کە ڕیز دەبەستن بە ڕیزبەستن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلصَّٰٓفَّٰتِ صَفّٗا ﴿١﴾ فَٱلزَّٰجِرَٰتِ زَجۡرٗا ﴿٢﴾ فَٱلتَّٰلِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٣﴾ إِنَّ إِلَٰهَكُمۡ لَوَٰحِدٞ ﴿٤﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَا وَرَبُّ ٱلۡمَشَٰرِقِ ﴿٥﴾ إِنَّا زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِزِينَةٍ ٱلۡكَوَاكِبِ ﴿٦﴾ وَحِفۡظٗا مِّن كُلِّ شَيۡطَٰنٖ مَّارِدٖ ﴿٧﴾ لَّا يَسَّمَّعُونَ إِلَى ٱلۡمَلَإِ ٱلۡأَعۡلَىٰ وَيُقۡذَفُونَ مِن كُلِّ جَانِبٖ ﴿٨﴾ دُحُورٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٞ وَاصِبٌ ﴿٩﴾ إِلَّا مَنۡ خَطِفَ ٱلۡخَطۡفَةَ فَأَتۡبَعَهُۥ شِهَابٞ ثَاقِبٞ ﴿١٠﴾ فَٱسۡتَفۡتِهِمۡ أَهُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَم مَّنۡ خَلَقۡنَآۚ إِنَّا خَلَقۡنَٰهُم مِّن طِينٖ لَّازِبِۭ ﴿١١﴾ بَلۡ عَجِبۡتَ وَيَسۡخَرُونَ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ذُكِّرُواْ لَا يَذۡكُرُونَ ﴿١٣﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ ءَايَةٗ يَسۡتَسۡخِرُونَ ﴿١٤﴾ وَقَالُوٓاْ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗا وَعِظَٰمًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ ﴿١٦﴾ أَوَءَابَآؤُنَا ٱلۡأَوَّلُونَ ﴿١٧﴾ قُلۡ نَعَمۡ وَأَنتُمۡ دَٰخِرُونَ ﴿١٨﴾ فَإِنَّمَا هِيَ زَجۡرَةٞ وَٰحِدَةٞ فَإِذَا هُمۡ يَنظُرُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُواْ يَٰوَيۡلَنَا هَٰذَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿٢٠﴾ هَٰذَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢١﴾ ۞ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ فَٱهۡدُوهُمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٢٣﴾ وَقِفُوهُمۡۖ إِنَّهُم مَّسۡـُٔولُونَ ﴿٢٤﴾

(٢) ئەوسا سوێند بەوانەی کە ڕێگری دەکەن لە خراپە کاریو خراپە کردن یان ئەو فریشتانەی کە پاڵ بە هەورەکانەوە دەنێنو بەملاو بەولایدا دەبەن بۆ باران بارین.

(٣) ئینجا سوێند بەوانەی قورئان دەخوێنن. جا لێرەدا دەگونجێت لە هەر سێ ئایەتەکەدامەبەست فریشتە بێت هەروەکو دەگونجێت خودی مرۆڤ مەبەست بێت، جا دەفەرموێ:

(٤) بەڕاستی خوداتان یەکەو هاوبەشی نیە نە لە زاتیداو نە لە سیفاتیداو نە لە کرداریدا، کە ئەو زاتە

(٥) پەروەردگاری ئاسمانانو زەویو ئەوەی کە لەنێوانیاندا هەیەو پەروەردگاری جێگای ڕۆژهەڵاتە کانە.رۆژ هەڵاتی خۆرومانگو ئەستێرەکان، ئەوانیش هەریەکەیان لەساڵدا چەندین جێگای لەیەك جیایان هەیە.

(٦) بێگومان ئێمە ئاسمانی نزیك لەم زەوییەمان بە ئەستێرەکان جوانو ڕەنگین کردوە.

(٧) جا کردمانن بە پارێزگاریکەر لە هەمو شەیتانێکی سەرکەشو نەگریس،

(٨) جا ئیتر ئەوان گوێ لە مەقامە بڵند پایەکانی ئاسمانان ناگرن، چونکە لە هەمو لایەکەوە ئاگرباران دەکرێن،

مَا لَكُمْ لَا تَنَاصَرُونَ ﴿٢٥﴾ بَلْ هُمُ ٱلْيَوْمَ مُسْتَسْلِمُونَ ﴿٢٦﴾ وَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٧﴾ قَالُوٓاْ إِنَّكُمْ كُنتُمْ تَأْتُونَنَا عَنِ ٱلْيَمِينِ ﴿٢٨﴾ قَالُواْ بَل لَّمْ تَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٩﴾ وَمَا كَانَ لَنَا عَلَيْكُم مِّن سُلْطَٰنٍۭ بَلْ كُنتُمْ قَوْمًا طَٰغِينَ ﴿٣٠﴾ فَحَقَّ عَلَيْنَا قَوْلُ رَبِّنَآ ۖ إِنَّا لَذَآئِقُونَ ﴿٣١﴾ فَأَغْوَيْنَٰكُمْ إِنَّا كُنَّا غَٰوِينَ ﴿٣٢﴾ فَإِنَّهُمْ يَوْمَئِذٍ فِى ٱلْعَذَابِ مُشْتَرِكُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَفْعَلُ بِٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍۭ ﴿٣٦﴾ بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٣٧﴾ إِنَّكُمْ لَذَآئِقُواْ ٱلْعَذَابِ ٱلْأَلِيمِ ﴿٣٨﴾ وَمَا تُجْزَوْنَ إِلَّا مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٤٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمْ رِزْقٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤١﴾ فَوَٰكِهُ ۖ وَهُم مُّكْرَمُونَ ﴿٤٢﴾ فِى جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٤٣﴾ عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٤﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍۭ ﴿٤٥﴾ بَيْضَآءَ لَذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ ﴿٤٦﴾ لَا فِيهَا غَوْلٌ وَلَا هُمْ عَنْهَا يُنزَفُونَ ﴿٤٧﴾ وَعِندَهُمْ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرْفِ عِينٌ ﴿٤٨﴾ كَأَنَّهُنَّ بَيْضٌ مَّكْنُونٌ ﴿٤٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٥٠﴾ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ إِنِّى كَانَ لِى قَرِينٌ ﴿٥١﴾

﴿٩﴾ ئەوشەيتانانە پالێپوە نراونو سزايەكی دياريان هەميشە بۆ هەيەو ئەو هەوالانەی كە لە پێش هاتنی پێغەمبەردا ﷺ بەگوێی جادووگەرو فالگرانيان دەدا، ئيتر دەستيان ناكەوێت چونكە بەو جۆرە ئاسمان پارێزراوەو رێگە لەوان گيراوە،

﴿١٠﴾ مەگەر ئەو شەيتانەی كە لەپڕ شتێكی لە دەنگ وباس وەبەر گوێی بكەوێتو بيفرێنێت ، ئەوسا ئەويش پارچە ئاگرێكی كونكەری بۆ دەفرێت ، جا هەندێك جار بەری دەكەوێتو دەيسوتێنێتو هەندێ جاريش بۆی دەردەچێت ئەمەش هەمووی بە ئارەزۆی (ﷲ)يە جا ئەو چۆن حەز بكات ئاوەها دەبێت.

﴿١١﴾ جا پرسياريان لێ بكەو بلێ: ئايا دروستكردنی ئەوان سەختترە يان ئەوانەی كە دروستمان كردوون لە فريشتەكانو ئاسمانەكانو زەوی؟ بەڕاستی ئێمە ئەوانمان لە قوڕێكی مچ كە دەلكا بەدەستەوە دروستكردوە، ئيتر بۆچی وا لەخۆبايی دەبنو پەروەردگاری خۆيان ناناسنو بەندايەتی بۆ ناكەن؟!

﴿١٢﴾ نەك هەر ئەوەندە بەڵكو تۆ سەرت سوڕماوە لەپلەو رێزی ئەم قورئانە لەحاڵێكدا كە ئەوان گاڵتەی پێدەكەن.

﴿١٣﴾ جا هەر كاتێكيش كە ئامۆژگاری بكرێن بير ناكەنەوەو سود وەرناگرن.

﴿١٤﴾ خۆ هەر كاتێك نيشانەيەك لە ڕاستیو دروستی ئەم پەيامە ببينن گاڵتەی پێ دەكەن .

﴿١٥﴾ ئەوسا دەڵێن ئەمە جگە لە جادويەكی ڕوونو ئاشكرا شتێكی تر نيە.

﴿١٦﴾ ئايا هەر كاتێك مردينو بووين بەخاكو ئێسقان ئايا بەڕاستی ئێمە زيندو دەكرێينەوە؟

﴿١٧﴾ ئايا هەروا خۆمانو باو باپيرانی پێشويشمان زيندوو دەكرێنەوە؟

﴿١٨﴾ بلێ : بەڵێ زيندو دەكرێنەوە لە حاڵێكدا كە ئێوە شەرمەندەو چاوشۆڕن.

﴿١٩﴾ ئينجا تەنها يەك دەنگەو دێتو هەمو زيندودەبنەوە ، ئەوسا تەماشا دەكەنو دەبينن چۆن وا هەمو خەڵك زيندو بونەتەوەو لە گۆڕەكانيان بەروت وقوتی وبەپێخاوسی هەستاون.

﴿٢٠﴾ ئەوسا دەڵێن: وای بۆ ئێمە چيمان بەخۆمان كرد، خۆئەمە ڕۆژی جەزايە. جا پێيان دەوترێ:

﴿٢١﴾ ئا ئەمەيە ڕۆژی جيا كردنەوەی چاكو خراپ كە ئێوە باوەڕتان پێی نەبو، جا لەوێدا ئيتر قسەيان لە دەم دەبڕنو بە فريشتەكانی مەئمور دەدرێت كە پێيان دەوترێ:

﴿٢٢﴾ ئا ئەوانەی كە بە شيركو تاوان ستەميان لە خۆ كردوەو ئەوانەش كە هەروەك ئەوان بون كۆيان بكەنەوەو ئەوانەيش كە پەرستويانن،

﴿٢٣﴾ جگە لە ﷲ ئەوسا بەرەو ڕێگای دۆزەخ ڕێنماييان بكەن.

﴿٢٤﴾ جا لەسەر پردی سەرڕوی دۆزەخ ڕايانگرن بەڕاستی ئەوان پرسيار لێكراون لە كارو كۆششی دنيان، جا زياتر شەرمەزار دەكرێنو پێيان دەوترێ:

﴿٢٥﴾ ئەوە چيتانە بۆ لێرەدا يارمەتی يەكتر نادەن وەك لە دنيادا لەسەر يەكترتان دەكردەوە؟!

﴿٢٦﴾ نەخێر يارمەتيدان نيە بەڵكو ئەمڕۆ ئەمان خۆيان داوە بەدەستەوەو هيچ توانای قسەو برياريان نيە، جا جوانتر بۆمان ڕۆشنتر دەكاتەوەو دەفەرموێ:

﴿٢٧﴾ ئەوسا هەندێكيان ڕوو لە هەندێكی تريان دەكەنو پرسيار لە يەكتر دەكەنو مقۆ مقۆيانە.

﴿٢٨﴾ پەيرەوی كەران بە پەيرەوی لێ كراوان دەڵێن: بەبێگومان كە ئێوە بون لە دنيادا بە ڕێگايەكی وا دەهاتنو قسەتان لەگەڵ

ئێمەدا دەکرد کە ئێمە دڵنیا بوین لێتان بەلاّم ئێوەفریوتان داین‌ولەخشتەتان بردین.

(٢٩) پەیرەوی لێکراوان بە ژێر دەستەکانیان دەڵێن: نەخێر بەقسەی ئێمەتان نەکردوە بەڵکو ئێوە هەر خۆتان باوەڕدار نەبون.

(٣٠) خۆ ئێمە هیچ دەسەلاّتێکمان بەسەر ئێوەدا نەبوە کە بەزۆر لە باوەڕهێنان لاتان بدەین ، بەڵکو ئێوە گەلێکی سەرکەش بون بە نەفامی خۆتان لە باوەڕ وازتان هێناوە.

(٣١) ئەوسا قسەی پەروەردگارمان کە خستنە ناو دۆزەخی ستەمکارانە ڕاست هاتە دی لەسەرمان، بێگومان ئێمە دەیچەژین سزای کردارەکانمان.

(٣٢) جا بێگومان ئێمە ئێوەمان سەر لێشێواند چونکە ئێمە سەرلێشێوێنەرین‌و سەرلێشێواو واتە: گلەییتان لێمان بێسودە چونکە ئێمەش هەر لە سزادین وەك ئێوە وحاڵمان لەئێوە جاکتر نیە.

(٣٣) جا بێگومان لەو ڕۆژەدا ئەوان لەو سزایەدا هاوبەشن ، چونکە لە سەرلێشێواوی دنیادا هەردوو هاوبەشی یەك بوون ، ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٣٤) بێگومان ئێمە هەر ئاوەها دەکەین بە تاوانباران .

(٣٥) بێگومان ئەوانە هەر کاتێك پێیان بوترایە-بڵێن- لا اله الا الله" واتە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لەالله خۆیان بە گەورە دەگرت‌و دانیان بەو راستیەدا نەدەنا.

(٣٦) جادەشڵێن: ئایا ئێمە واز بهێنین لە خواکانمان لەبەر قسەی شاعیرێکی شێت؟ پەروەردگاریش بەدەمیان دا دەداتو دەفەرموێ:

(٣٧) نەخێر ئەو نە شاعیرەو نە شێت بەڵکو بەڕاستی هاتووەو باوەڕی بەتەواوی پێغەمبەران هەیە. ئینجا پەروەردگار ڕوویان تێدەکاتو دەفەرموێ:

(٣٨) بێگومان ئێوە سزای بەژان دەچەژن لەسەر ئەو بێباوەڕیو وتارو کردارە ناپەسندانە تان.

(٣٩) خۆ هەر تۆڵەی ئەوەتان لێوەردەگیرێت کە کردوتانە .

(٤٠) بێجگە لەبەندە شایستەکان چونکە ئەوان بەهۆی کرداری چاکی خۆیانەوە لەو سزا بەژانە دوورن بەڵکو ئەمان لە نازو نیعمەتدان وەك دەفەرموێ:

(٤١) بۆ ئەوان ڕۆزییەکی دیاری هەیە. بەبەیانیان‌و ئێواران.

يَقُولُ أَإِنَّكَ لَمِنَ ٱلْمُصَدِّقِينَ ﴿٥٢﴾ أَإِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَٰمًا أَإِنَّا لَمَدِينُونَ ﴿٥٣﴾ قَالَ هَلْ أَنتُم مُّطَّلِعُونَ ﴿٥٤﴾ فَٱطَّلَعَ فَرَءَاهُ فِى سَوَآءِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٥﴾ قَالَ تَٱللَّهِ إِن كِدتَّ لَتُرْدِينِ ﴿٥٦﴾ وَلَوْلَا نِعْمَةُ رَبِّى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُحْضَرِينَ ﴿٥٧﴾ أَفَمَا نَحْنُ بِمَيِّتِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا مَوْتَتَنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿٥٩﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٦٠﴾ لِمِثْلِ هَٰذَا فَلْيَعْمَلِ ٱلْعَٰمِلُونَ ﴿٦١﴾ أَذَٰلِكَ خَيْرٌ نُّزُلًا أَمْ شَجَرَةُ ٱلزَّقُّومِ ﴿٦٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهَا فِتْنَةً لِّلظَّٰلِمِينَ ﴿٦٣﴾ إِنَّهَا شَجَرَةٌ تَخْرُجُ فِىٓ أَصْلِ ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٤﴾ طَلْعُهَا كَأَنَّهُۥ رُءُوسُ ٱلشَّيَٰطِينِ ﴿٦٥﴾ فَإِنَّهُمْ لَءَاكِلُونَ مِنْهَا فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٦٦﴾ ثُمَّ إِنَّ لَهُمْ عَلَيْهَا لَشَوْبًا مِّنْ حَمِيمٍ ﴿٦٧﴾ ثُمَّ إِنَّ مَرْجِعَهُمْ لَإِلَى ٱلْجَحِيمِ ﴿٦٨﴾ إِنَّهُمْ أَلْفَوْا۟ ءَابَآءَهُمْ ضَآلِّينَ ﴿٦٩﴾ فَهُمْ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمْ يُهْرَعُونَ ﴿٧٠﴾ وَلَقَدْ ضَلَّ قَبْلَهُمْ أَكْثَرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٧١﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا فِيهِم مُّنذِرِينَ ﴿٧٢﴾ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٧٤﴾ وَلَقَدْ نَادَىٰنَا نُوحٌ فَلَنِعْمَ ٱلْمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ وَنَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥ مِنَ ٱلْكَرْبِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٦﴾

(٤٢) کە میوەهاتی زۆرەو ئەوان ڕێز لێگیراویشن،

(٤٣) لەناو باخچە گەلی پڕ خێرو بێردان.

(٤٤) کە لەسەر تەختەکان ڕووبەڕوی یەکتر دادەنیشن .

(٤٥) بەناویاندا دەخولێنرێتەوە پیاڵەی پڕ لە شەراب لە سەرچاوەی هەمیشە ڕەوان.

(٤٦) کە سپیەو بەتامە بۆ نۆشنکەرانی.

(٤٧) لەو شوێنەدا نە عەقڵ لە دەست دان هەیەو نە سەرخۆش دەبن.

(٤٨) خۆ لە لایاندایە ئافرەتانێکیش کە هەمیشە چاویان لە مێردیانەو چاو گەورەن.

(٤٩) سپیو تۆز لێ نەکەوتون وەکو هێلکەی شاراوەن ، جا لەوێدا دادەنیشن‌و باسی دنیای خۆیان دەکەن‌و هەرکەس هاورێی دنیای خۆی دەکەوێتە بیر.

(٥٠) ئەوسا هەندێکیان ڕوو لە هەندێکیان دەکەن‌و لە یەکتر ئەپرسن،

(٥١) یەکێك لەوان دەڵێ: من دۆستێکم بو لە دنیادا باوەڕی بە زیندوکردنەوە نەبو.

وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُۥ هُمُ ٱلْبَاقِينَ ﴿٧٧﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِى ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿٧٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٍ فِى ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبْرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ إِذْ جَآءَ رَبَّهُۥ بِقَلْبٍ سَلِيمٍ ﴿٨٤﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ وَقَوْمِهِۦ مَاذَا تَعْبُدُونَ ﴿٨٥﴾ أَئِفْكًا ءَالِهَةً دُونَ ٱللَّهِ تُرِيدُونَ ﴿٨٦﴾ فَمَا ظَنُّكُم بِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ فَنَظَرَ نَظْرَةً فِى ٱلنُّجُومِ ﴿٨٨﴾ فَقَالَ إِنِّى سَقِيمٌ ﴿٨٩﴾ فَتَوَلَّوْا۟ عَنْهُ مُدْبِرِينَ ﴿٩٠﴾ فَرَاغَ إِلَىٰٓ ءَالِهَتِهِمْ فَقَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ ﴿٩١﴾ مَا لَكُمْ لَا تَنطِقُونَ ﴿٩٢﴾ فَرَاغَ عَلَيْهِمْ ضَرْبًۢا بِٱلْيَمِينِ ﴿٩٣﴾ فَأَقْبَلُوٓا۟ إِلَيْهِ يَزِفُّونَ ﴿٩٤﴾ قَالَ أَتَعْبُدُونَ مَا تَنْحِتُونَ ﴿٩٥﴾ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ قَالُوا۟ ٱبْنُوا۟ لَهُۥ بُنْيَٰنًا فَأَلْقُوهُ فِى ٱلْجَحِيمِ ﴿٩٧﴾ فَأَرَادُوا۟ بِهِۦ كَيْدًا فَجَعَلْنَٰهُمُ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٩٨﴾ وَقَالَ إِنِّى ذَاهِبٌ إِلَىٰ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٩٩﴾ رَبِّ هَبْ لِى مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٠٠﴾ فَبَشَّرْنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٍ ﴿١٠١﴾ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾

﴿٥٢﴾ دەی وت بە من: ئایا تۆ لە باوەڕدارانی بە ڕۆژی زیندوبونەوەو بە ڕاستی دەزانی؟

﴿٥٣﴾ ئایا ئێمە کە مردین و بوین بە ئێسقان تازە حیسابمان لێوەردەگرنەوە؟

﴿٥٤﴾ دەڵێ: ئایا ئێوە هیچ هەواڵێکتان لەورەفیقەی من هەیە؟

﴿٥٥﴾ ئەوسا خۆیشی دەست بە هەواڵ زانینی دەکات کەچی دەبینێ وا لە ناوەڕاستی دۆزەخدایە،

﴿٥٦﴾ وتی: بەخوا وەختو منیش لەناو ببیەت،

﴿٥٧﴾ خۆئەگەر سۆزی پەروەردگارم نەبوایەو منی دوور نەخستایەوە لە تۆ ئێستا منیش لە گەل سزادراواندا لەگەڵ تۆدا دەبوم، جا بە ئەو دەڵێ:

﴿٥٨﴾ ئایا وانیە کە ئیتر ئێمە هەرگیز نامرین،

﴿٥٩﴾ مەگەر ئەو مردنە سەرەتایەی دنیاو ئەویش تەواو بو ، بەڵکو بۆ هەمیشە لەناو نازو نیعمەتداین و هەرگیز ئێمە سزا نادرێین؟

﴿٦٠﴾ بێگومان ئەم نازونیعمەتەی خەڵکی بەهەشت بەهرەمەندیو سەرکەوتنێکی گەورەیە.

﴿٦١﴾ جا با بۆ دستکەوتی ئاوەها ئیشکەران ئیش بکەن.

﴿٦٢﴾ ئایا ئەوە میواندارییەکی چاکە یان پێشوازیی بە درەختی زەقنەموت؟

﴿٦٣﴾ بەڕاستی ئێمە ئەو درەختەمان کردوە بە هۆی تاقی کردنەوەیەك بۆ ستەمکاران.

﴿٦٤﴾ چونکە ئەوە درەختێکەو لەناو ئاگری دۆزەخەوە دەردێت.

﴿٦٥﴾ هێشوەکەی هەروەکو سەری شەیتانان روو ناشیرین و ترسناکە، جا خوانەناسان گاڵتە بەمە دەکەن و دەڵێن: درەختی شین و ئاگری سوتێنەر؟! بەڕاستی ئەوان هێشتا خوایان نەناسیوەو هێزو دانایی ئەو زاتەیان نەزانیوە.

﴿٦٦﴾ جا ئەوان لەو درەختە دەخۆن و سکیانی لێ پڕ دەکەن.

﴿٦٧﴾ پاشان لەسەر ئەو خواردنەیش زوخاوێکی زۆر داخیان بۆ هەیەو دەیخۆنەوە،

﴿٦٨﴾ پاشان بێگومان جێگەیان هەر گەڕانەوەیە بۆدۆزەخ.

﴿٦٩﴾ بێگومان ئەوان لەدنیادابە شوێن باو باپیرانیاندا کە لاڕێ و گومڕا بون دەچون.

﴿٧٠﴾ ئەوسا ئەوان بە شوێن ئەواندا ڕادەکەن واتە: ئەوەندە چەسپاون بە خراپەو نەفامیەوە وەك ئەوەی کە ڕابکەن بە شوێن ئەو بەرنامە نارێك و ناپەسەندەدا .

﴿٧١﴾ بەحەقیقەت زۆربەی خەڵکانی پێش ئەوانیش گومڕا بون،

﴿٧٢﴾ وە بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانمان بۆ ڕەوانە کردوون و پەیامی (ﷲ) یان پێگەیاندوون، بەڵام زۆربەی ئەوان دژایەتیان کردون و گومڕا بون.

﴿٧٣﴾ جا تەماشا بکەن و بزانن سەر ئەنجامی بێباوەڕان چی بو، واتە، بزانن کە ئەوەش بۆ ئێوە هەیە ئەگەر دژایەتی پێغەمبەرەکەی خۆتان بکەن.

﴿٧٤﴾ جگە لەو بەندانەی کە بە دڵسۆزییەوە (ﷲ) یان پەرستوە بەراستی ئەوانە لەناو هەرگەلدابن سەربەرزو رزگارن.

﴿٧٥﴾ بەڕاستی نوح هاواری بۆ هێناین وئێمەش وەڵاممان دایەوە خۆ ئێمە باشترین وەڵام دەرەوەین،

﴿٧٦﴾ ئەوساخۆی و خاو خێزان و پەیڕەوانیمان لەو تەنگانە گەورەیە ڕزگارکرد.

﴿٧٧﴾ جا دامان نا کە هەر نەوەی ئەو بمێننەوە، ئەوە بوا ﷲ بەولافاوە هەمو مرۆڤی قڕکرد جگە لەنەوەی ئەوو کۆمەڵێکی

کەم کە باوەڕداربون پاشان هەر لەنەوەی ئەو خەڵکی سەرلەنوێ پەرەی سەندەوە ، واتە: تەواوی مرۆڤ لە دوو پێغەمبەرەوە هاتون **یەکەم**، ئادەم، **دووهەم**، نوح ﷺ ، جا هەر کەسێك لاف پەیرەوی باوباپیری خۆی لێدەدات دەبێ خواناس‌وموسڵمان بێت ئەگینا شەیتان فریوی داوەو درۆ دەکات لەگەڵ باوك‌وباپیرانی خۆیشیدا.

(٧٨) ئەوسا لەناو خەڵکانی پاش خۆیشی ناوی خۆشمان بۆ هێشتەوە، ئەوەتا ئێستا هەمو گەلێك ڕێزی نوح دەگرێت‌و بە باپیری خۆی دەزانێت کە لەراستیشدا وایە ، چونکە وەك وتمان پاش نوح هەر چی خەڵکی تر بووە دەبن هەر لە نەوەی نوحن بۆیە بەو وتراوە ئادەمی دووهەم.

(٧٩) لەناو جیهانیاندا درود بۆ نوح.

(٨٠) بێگومان ئێمە هەر ئاوەها پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

(٨١) بێگومان ئەو لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمە بو رزگارکرا.

(٨٢) پاشان ئەوانی ترمان لەناو ئاودا خنکاند.

(٨٣) بێگومان ئیبراهیم لە دەستەو دایرەی ئەو بوە.

(٨٤) ئەو کاتەی کە هات بەرەو رەزای پەروەردگاری خۆی بە دڵێکی پاکەوە.

(٨٥) ئەو کاتەی کە بە باوکی‌و بە گەلەکەی خۆی وت : ئەوە چیە دەیپەرستن؟!

(٨٦) ئایا بێجگە لە ﷲ بەناحەق خودایانێکی ترتان دەوێت؟

(٨٧) سا ئێوە سەبارەت بە پەروەردگاری جیهانیان چی دەڵێن‌و بیرو باوەڕتان چۆنەو دەتانەوێت چۆن حیسابتان لەگەڵدا بکات کاتێك کە دەگەڕێنەوە بۆلای؟

(٨٨) جا ئیبراهیم بۆ خۆ دزینەوە لە گەلەکەی‌و شکاندنی بتەکان چونکە کاتی دەرچونیان بو بۆ جەژنیان بە تەماشا کردنێکی سەیر تەماشای هەسارەکانی کرد وەك ئەوەی کەمرۆڤێکی لەسەرحاڵ نەبێت.

(٨٩) ئەوسا وتی: بێگومان من نخۆشم ، نەچو بۆجەژنەکەیان.

(٩٠) ئیتر ئەوانیش گوێیان پێنەدا و پشتیان تێکردو چوون بۆ دەرەوە بۆ جەژن‌وسەیرانی خۆیان.

(٩١) ئینجا ئەویش لەو کاتە هەلی وەرگرت‌و خۆی کێشایە لای خواکانیان کە بۆ پیرۆزی خواردنیان لەپێشدا بۆ دانا بون تا کاتێ گەڕانەوە پیرۆز بێ‌و بیخۆن جا پێی وتن: بۆ نان ناخۆن؟!

(٩٢) خۆ وەڵامیان نەبو جاپێی وتن بۆچی قسە ناکەن؟

(٩٣) جا بە دەستی ڕاست‌و بە هەمو هێزیەوە تێی سرەواندن‌و جگە لە بتە گەورەکەیان ئەوانی تری هەمو شکاند. بێگومانم کە ئەم فەریکە موسڵمانانەی ئەم سەردەمە لەو کاتەی ئیبراهیم دا بونایە هەمویان کافر دەبون چونکە ئەو بت شکاندنەیان بە شتێکی بێسوود دەزانی؟! هەی فەوتاوان تا لەژیاندان بیر بکەنەوە! بەسیەتی ئارەزۆ پەرستی بەناو خوا پەرستیەوە، ئەم کارەی ئیبراهیم ﷺ بێ کەس‌و بێ پارت‌و بێ یارمەتی دەری ڕواڵەتی بێنە بەر چاوتان‌و بزانن بەو بۆچونەی ئەمرۆتان چ بڕیارێکی بەسەردا دەن؟ پاشان بزانن پەروەردگاری جیهانیان چ بڕیارێکی بەسەردا داوە جا بزانە تۆ دانایت یان ﷲ.

(٩٤) ئەوسا ئەوان بە پەلە ڕوویان تێکرد کاتێك کە بینیان بتەکانیان شکاوەو پاش پرس‌و ڕاو هێنانی ئیبراهیم‌و بۆیان دەرکەوت کە ئەو بوە ، جا دەستیان کرد بە سەرزەنشت کردنی کە ئەمە لە سورەتی (ئەنبیا)دا بە درێژی باسکراوە.

(٩٥) ئیبراهیم وتی: ئێوە شتانێك دەپەرستن کە خۆتان دەیانتاشن‌و جوانیان دەکەن‌و دەیانکەن بە خوای خۆتان؟

(٩٦) لە حاڵێکدا کە ﷲ ئێوەی دروستکردووە ئەوەیش کە دەیکەن، هەردوو دروستکراوی ئەو زاتەن ، دەی ژیر بن تەنها ئەو بپەرستن، جا ئەو نەزانانە لە جیاتی بیر کردنەوەو گەڕانەوە لەو هەڵە گەورەیە هەڕەشەی سوتانیان لێکردوە. وتیان: بیناو ساختمان گەلێك دروست بکەن‌و پڕیکەن لە دارو ئاگری بدەن جا کاتێك گڕی گرت‌و ئاگر تیژبو،

(٩٧) ئەوسا ئەو فڕەبدەنە ئەو ئاگرەوە

(٩٨) جا ئەوان ویستیان بەو فڕوفێڵە لەناوی ببەن بەڵام ﷲ دەفەرموێ: ئێمە ئەوانمان سوك‌و شەرمەندە کردو بە فەرمانی ﷲ ئاگر ئیبراهیمی نەسوتاند.

(٩٩) ئەوسا ئیبراهیم ﷺ وتی: بێگومان من لێرە کۆچ دەکەم بۆ ئەنجامدانی بڕیارەکانی پەروەردگارم کە بەم زوانە ڕێنمایم دەکات کە بۆ کوێ بچم. بەڵێ لە وڵاتی خۆی کە عێراقە دەرچوو بەرەو شام ، جا کاتێك کە گەیشتە زەوی بە پیت‌و فەڕ، داوای لە پەروەردگاری کردو وتی:

(١٠٠) ئەی پەروەردگارم کوڕێکم پێبدە لە پیاوچاکانبێ، پەروەردگاریش دەفەرموێ:

فَلَمَّآ أَسۡلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلۡجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ أَن يَٰٓإِبۡرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدۡ صَدَّقۡتَ ٱلرُّءۡيَآۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلۡبَلَٰٓؤُاْ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيۡنَٰهُ بِذِبۡحٍ عَظِيمٖ ﴿١٠٧﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِ فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ ﴿١٠٩﴾ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١١٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١١﴾ وَبَشَّرۡنَٰهُ بِإِسۡحَٰقَ نَبِيّٗا مِّنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١١٢﴾ وَبَٰرَكۡنَا عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ إِسۡحَٰقَۚ وَمِن ذُرِّيَّتِهِمَا مُحۡسِنٞ وَظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ مُبِينٞ ﴿١١٣﴾ وَلَقَدۡ مَنَنَّا عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١١٤﴾ وَنَجَّيۡنَٰهُمَا وَقَوۡمَهُمَا مِنَ ٱلۡكَرۡبِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿١١٥﴾ وَنَصَرۡنَٰهُمۡ فَكَانُواْ هُمُ ٱلۡغَٰلِبِينَ ﴿١١٦﴾ وَءَاتَيۡنَٰهُمَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلۡمُسۡتَبِينَ ﴿١١٧﴾ وَهَدَيۡنَٰهُمَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴿١١٨﴾ وَتَرَكۡنَا عَلَيۡهِمَا فِي ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١١٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰ مُوسَىٰ وَهَٰرُونَ ﴿١٢٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٢١﴾ إِنَّهُمَا مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١٢٢﴾ وَإِنَّ إِلۡيَاسَ لَمِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ أَتَدۡعُونَ بَعۡلٗا وَتَذَرُونَ أَحۡسَنَ ٱلۡخَٰلِقِينَ ﴿١٢٥﴾ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡ وَرَبَّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٢٦﴾

﴿١٠١﴾ ئەوسا ئێمەیش موژدەمان پێدا بە کوڕێکی لەسەرخۆو بە حەوسەڵە.

﴿١٠٢﴾ جا کاتێك ئەو کوڕە گەورە بو تووانای ئیشکردنی پەیدا کرد لەگەڵ باوکی دا، ئیبراهیم خەونی بینی کە لەو خەونەدا فەرمانی پێکرا کە کوڕەکەی سەر ببڕێت. باوکێك چەندین ساڵە منداڵی نیەو لەو سەردەمەی تەمەنیدا لە اللّٰه پاڕایەوە کە کوڕی پێبداتو ئەویش کوڕی پێدا کەچی وا ئێستا گەورە بووەو توانای کاری هەیە لەگەڵیدا کەچی فەرمانی پێدەکرێت کە ئەو کوڕەی بکات بە قوربانی، جا ئەویش وتی: ئەی کوڕی خۆشەویستم من لە خەونم دا بینیومە کە تۆ سەر دەبڕم جا تۆیش تەماشا بکەو بزانە چ بڕیارێك دەدەیتو ئەم خەونە بەچی دەزانیت، کوڕەیش وتی: ئەی باوکی خۆشەویستم ئەوەی کە تۆ ئەمرت پێکراوە بیکە إن شاءالله تۆ منت لەناو خۆگرانـدا دەست دەکەوێت ، واتە: خۆ دەگرم بۆ ئەو سەربڕینە، بەڵێ ئەوەیە باوكو فەرزەندی ڕاستو خواناس، کام لە ئێمە ئاوا ئامادەین کە خۆشەویسترین کەسمان فیدای اللّٰه بکەینو کام لە فەرزاندان ئاوا گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری باوکی خۆی دەکات بۆئەنجامدانی فەرمان اللّٰه؟

﴿١٠٣﴾ جا کاتێك هەردووکیان خۆیان دا بەدەست بڕیاری (اللّٰه)وەو لەسەر ناوچاوان ڕایکێشا بۆ سەربڕینو کێردی لە ملی نا.

﴿١٠٤﴾ لەو کاتەدا ئێمە بانگمان کرد کە ئەی ئیبراهیمعليه السلام.

﴿١٠٥﴾ بێگومان تۆ خەونی خۆتت هێنایە دی جا ئێمەش هاتین بە هاوارتانەوەو لەو تەنگانە ڕزگارمان کردن، خۆ بێگومان هەر ئاوەها ئێمە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

﴿١٠٦﴾ بێگومان کە ئەمە تاقی کردنەوەیەکی ڕوون بو بۆ ئەو دوو پێغەمبەرە سەلامی خوایان لێبێ.

﴿١٠٧﴾ جا ئیسماعیلمانعليه السلام دایەوە بە ئیبراهیمعليه السلام وبەرانێکی گەورەمان لەجیاتی ئەودا بۆنارد کە بیکات بە قوربانی. قوربانی ئەم ئومەتەیش لەوێوە سەرچاوە دەگرێت.

﴿١٠٨﴾ جا لەناو بەرەی ئاییندەدا وامان لێکرد کە بەچاکی ناوی ببەن.

﴿١٠٩﴾ درود بۆ ئیبراهیم کە بەچاکی فەرمانی ئێمەی ئەنجامدا.

﴿١١٠﴾ ئێمە هەر ئاوەها پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە،

﴿١١١﴾ بەبێگومان ئەو لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمە بو.

﴿١١٢﴾ ئەوسا موژدەیشمان پێدا بە ئیسحاق کە پێغەمبەرێکە لەناو پیاوچاکان. وە ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو کوڕەی ئامادەی سەربڕین بو ئیسحاق نەبوە وەك هەندێك وتویانە. ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿١١٣﴾ خەیرو فەڕمان ڕژاند بەسەر خۆیو بەسەر ئیسحاقدا جا لەناو نەوەکانیاندا چاکەکارو بەڕوونی ستەمکار لە خۆ، دەبێ.

﴿١١٤﴾ خۆ بەڕاستی منەتیشمان نایە سەر موساو هارون.

﴿١١٥﴾ جاخۆیان و گەلەکەیانمان ڕزگارکرد لەو تەنگانە گەورەیەی کە تێیدا بون بەدەست فیرعەونەوە.

﴿١١٦﴾ جا یارمەتیمان دان ئەوسا ئەوان زاڵبون بەسەر دوژمنانیاندا کە فیرعەونو دەستو دایرەی بو.

﴿١١٧﴾ خۆ پەڕاوی ڕۆشنکەرەوەمان کە تەورات بو پێدان.

﴿١١٨﴾ ئەوسا ڕێگای ڕاستمان پێشاندان.

﴿١١٩﴾ جا وامان لێکردن کە پاش خۆیان بە چاکە ناویان ببەن.

﴿١٢٠﴾ درود بۆ موساو هارون.

﴿١٢١﴾ بێگومان ئێمە هەر ئاوەها پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

﴿١٢٢﴾ بێگومان ئەو دووانە هەردووکیان لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمە بون. ئینجا پەروەردگار باسی ئیلیاسعليه السلام دەکاتو دەفەرموێ:

(١٢٣) بەڕاستی ئیلیاس عليه السلام یەکێکە لە پێغەمبەران.

(١٢٤) جا وەبیریان بێنەوە ئەو کاتەی کە بە گەلەکەی وت: ئایا ئێوە خۆتان ناپارێزن لەو شتانەی کە بەلای (الله)وە ناڕەوایە؟! واتە: خۆتان بپارێزن‌و لە پەروەردگار بترسن.

(١٢٥) ئایا ئێوە ئەوبتەی کەناوی بەعلە دەپەرستن و واز لە چاکترینی دروستەکەران دەهێنن کە (الله)یە؟

(١٢٦) کە پەروەردگارتانە‌و پەروەردگاری باو باپیرانتانە؟

(١٢٧) ئەوسا ئەوان باوەڕیان پێ نەکرد ، ئینجا ئەوان بەڕاستی ئامادە دەکرێن بۆ لێپرسینەوەو حیساب‌و تۆڵە.

(١٢٨) جگە لە بەندە چاکەکانی الله ، کە ئەوان بە چاکە پاداشت دەدرێنەوە.

(١٢٩) وە لەپاش خۆی ناوی چاکمان بۆ هێشتەوە،

(١٣٠) وەدرودیش لە ئیلیاس،

(١٣١) بێگومان ئێمە هەر بەم شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە.

(١٣٢) بەڕاستی ئەو یەکێکە لە بەندە باوەڕدارەکانی ئێمە. ئینجا پەروەردگار بە کورتی باسی لووت عليه السلام‌و پاشان باسی یونس عليه السلام دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٣٣) جا بێگومان کە لووت عليه السلام لە پێغەمبەرانە، پەروەردگار ناردی بۆ سەر گەلێکی ڕەوشت نزم بەڵام هەرچەند ئامۆژگاری کردن سودی نەبو پاشان الله ئەو گەلەی لەناوبرد بە سەروبن کردنی خۆیان‌و دێهاتەکانیان‌و لووتی ڕزگارکرد ،وەك دەفەرموێ:

(١٣٤) باس بکە ئەو کاتەی کە ئێمە خۆی‌و دەست‌و دایرەکەیمان هەموو ڕزگار کرد،

(١٣٥) جگە لە پیرەژنەکەی خێزانی کە لەناو لەناوچواندا مایەوە چونکە ئەویش بە بیر و بۆچون یارمەتی ئەو گەلەی دەدا.

(١٣٦) پاشان ئەوانی ترمان لەناو بردن.

(١٣٧) جا بەڕاستی ئێوە لەکاتی سەفەرتان دا بە ڕۆژ دەدەن بەلای ئەواندا،

(١٣٨) وەبەشەویش‌و هەمیشە شوێنەواری ئەوان دەبینن دەی ئایا ژیر نابن‌و لەوان پەندو ئامۆژگاری وەرناگرن؟ واتە، دژایەتی پێغەمبەرەکەتان نەکەن ، نەك وەك ئەوان تۆڵەتان لێوەرگیرێت؟

(١٣٩) خۆ بێگومان یونسیش عليه السلام لە پێغەمبەرانە.

فَكَذَّبُوهُ فَإِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٢٨﴾ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي ٱلْـَٔاخِرِينَ ﴿١٢٩﴾ سَلَٰمٌ عَلَىٰٓ إِلْ يَاسِينَ ﴿١٣٠﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِي ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣١﴾ إِنَّهُۥ مِنْ عِبَادِنَا ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ وَإِنَّ لُوطًا لَّمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٣﴾ إِذْ نَجَّيْنَٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿١٣٤﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿١٣٥﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٣٦﴾ وَإِنَّكُمْ لَتَمُرُّونَ عَلَيْهِم مُّصْبِحِينَ ﴿١٣٧﴾ وَبِٱلَّيْلِ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٣٨﴾ وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٣٩﴾ إِذْ أَبَقَ إِلَى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١٤٠﴾ فَسَاهَمَ فَكَانَ مِنَ ٱلْمُدْحَضِينَ ﴿١٤١﴾ فَٱلْتَقَمَهُ ٱلْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿١٤٢﴾ فَلَوْلَآ أَنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلْمُسَبِّحِينَ ﴿١٤٣﴾ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِۦٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٤٤﴾ ۞ فَنَبَذْنَٰهُ بِٱلْعَرَآءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴿١٤٥﴾ وَأَنۢبَتْنَا عَلَيْهِ شَجَرَةً مِّن يَقْطِينٍ ﴿١٤٦﴾ وَأَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ مِائَةِ أَلْفٍ أَوْ يَزِيدُونَ ﴿١٤٧﴾ فَـَٔامَنُوا۟ فَمَتَّعْنَٰهُمْ إِلَىٰ حِينٍ ﴿١٤٨﴾ فَٱسْتَفْتِهِمْ أَلِرَبِّكَ ٱلْبَنَاتُ وَلَهُمُ ٱلْبَنُونَ ﴿١٤٩﴾ أَمْ خَلَقْنَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ إِنَٰثًا وَهُمْ شَٰهِدُونَ ﴿١٥٠﴾ أَلَآ إِنَّهُم مِّنْ إِفْكِهِمْ لَيَقُولُونَ ﴿١٥١﴾ وَلَدَ ٱللَّهُ وَإِنَّهُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿١٥٢﴾ أَصْطَفَى ٱلْبَنَاتِ عَلَى ٱلْبَنِينَ ﴿١٥٣﴾

ئەم پێغەمبەرەش وەکو لە سورەتی (ئەنبیاو شوعەراو ئەعراف ) و چەند جێگای تردا هاتوە زۆر زەحمەتی کێشاوە لەگەڵ گەلەکەی خۆیدا بەڵام باوەڕیان پێ نەکرد وە ئەویش بەبێ ئەوەی فەرمانی خوای بۆ بێت ئەو گەلەی بەجێ هێشتوەو وای بیر نەدەکردەوە دوچاری تەنگانە بکرێت، جا لێرەدا هەندێ لەو سەفەرەیمان بۆ باس دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٤٠) وەبیریان بهێنەرەوە ئەو کاتەی کەڕای کردو چوە لای کەشتیەکی پڕو ئەوانیش هەڵیان گرت ، بەڵام لە دەریادا لەبەر زۆری بارەکەی نزیك بو کە هەمویان نوقمی دەریا ببن لەبەر ئەوە ناچار بون کە کەسێکی لێ بخەنە ناو دەریاوە تا بەڵکو باقی تریان ڕزگاریان ببێت.

(١٤١) جا تیروپشکیان کرد کەچی ئەو لەوانە بو کە وەبەرفڕەدان کەوت‌و خستیانە ناو دەریاوە.

(١٤٢) ئەوسا ماسیەکی گەورە قووتی دا لە حاڵێکدا کە خۆی سەرزەنشتی خوی دەکرد لەسەر ئەو کارەی کە کردی‌و پاڕایەوە لە پەروەردگاری‌و دانی نا بە هەڵەی خۆیداو خۆی بە ستەمکار ناوبرد جا پەروەردگار هات بەهاواریەوەو لەو تەنگانە گەورەیە ڕزگاری کرد.

(١٤٣) جا ئەگەر ئەو لەو کەسانە نەبوایە کە بە پاکی تەسبیحاتی پەروەردگاری خویان دەکەن‌و دانی بە هەڵەی خۆیدا نەنایە،

مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿١٥٤﴾ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٥٥﴾ أَمْ لَكُمْ سُلْطَٰنٌ مُّبِينٌ ﴿١٥٦﴾ فَأْتُوا۟ بِكِتَٰبِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٥٧﴾ وَجَعَلُوا۟ بَيْنَهُۥ وَبَيْنَ ٱلْجِنَّةِ نَسَبًا ۚ وَلَقَدْ عَلِمَتِ ٱلْجِنَّةُ إِنَّهُمْ لَمُحْضَرُونَ ﴿١٥٨﴾ سُبْحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٠﴾ فَإِنَّكُمْ وَمَا تَعْبُدُونَ ﴿١٦١﴾ مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا مِنَّآ إِلَّا لَهُۥ مَقَامٌ مَّعْلُومٌ ﴿١٦٤﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلصَّآفُّونَ ﴿١٦٥﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ ٱلْمُسَبِّحُونَ ﴿١٦٦﴾ وَإِن كَانُوا۟ لَيَقُولُونَ ﴿١٦٧﴾ لَوْ أَنَّ عِندَنَا ذِكْرًا مِّنَ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٦٨﴾ لَكُنَّا عِبَادَ ٱللَّهِ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿١٦٩﴾ فَكَفَرُوا۟ بِهِۦ ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿١٧٠﴾ وَلَقَدْ سَبَقَتْ كَلِمَتُنَا لِعِبَادِنَا ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٧١﴾ إِنَّهُمْ لَهُمُ ٱلْمَنصُورُونَ ﴿١٧٢﴾ وَإِنَّ جُندَنَا لَهُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴿١٧٣﴾ فَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٤﴾ وَأَبْصِرْهُمْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٥﴾ أَفَبِعَذَابِنَا يَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٧٦﴾ فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَآءَ صَبَاحُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٧﴾ وَتَوَلَّ عَنْهُمْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿١٧٨﴾ وَأَبْصِرْ فَسَوْفَ يُبْصِرُونَ ﴿١٧٩﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّكَ رَبِّ ٱلْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿١٨٠﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَى ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٨١﴾ وَٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٨٢﴾

## سُورَةُ صٓ ٣٨ ٨٨

﴿١٤٤﴾ بێگومان لەناو سکی ئەو ماسیەدا دەمایەوە هەتا ئەو ڕۆژەی کە خەڵك زیندو دەکرانەوە، واتە: هەتا قیامەت لەوێدا دەبو.

﴿١٤٥﴾ جا ئێمە بە دەرکردنی فەرمانمان بۆ ئەو ماسیەو هێنانەوەی بۆ کەناری دەریاو هەڵهێنانەوەی خستمانە ئەو چۆڵاییەوە لە حاڵێکدا کە لەشی کوتراو نەخۆشبوو توانای هیچ جموجوڵی نەبو، مێشو مەگەزیش لێی کۆدەبوونەوەوئازاریان دەدا، بەڵام پەروەردگار خستیە بەر ڕەحمەتی خۆیو دەفەرموێ:

﴿١٤٦﴾ ئەوسا ئێمە درەختی کولەکەمان بۆ ڕوواند کە پەلکەکانی بدا بەخۆیدا تا مێشو مەگەز لێی نزیك نەبنەوەو ئازاری نەدەن.

﴿١٤٧﴾ جا پاش چاك بونەوەی ناردمان بۆ گەلێك کە سەد هەزار کەسو زیاتریش دەبوون.

﴿١٤٨﴾ ئەوسا ئەوانیش باوەڕیان هێناو تا ماوەیەك ژیانی خۆشمان پێدان، ئینجا ﷲ بەشێوەی پرسیاری سەرزەنشتی ڕولەو گەلو هۆزو کەسانە دەکات کە دەڵێن فریشتەکان کچی خودانو دەفەرموێ:

﴿١٤٩﴾ دەسا لێیان بپرسە ئایا پەروەردگاری تۆ کچی هەیەو ئەوان کوڕیان هەیە؟

﴿١٥٠﴾ یان ئایا ئەوان لەوێ بوون کە ئێمە فریشتەکانمان مێینە دروستکردوە؟

﴿١٥١﴾ باش بزانن بێگومان هەر بەشێکە لە درۆکانیان کە دەڵێن:

﴿١٥٢﴾ ﷲ منداڵی بوەوبێگومان کە ئەوان لەو قسەو باسانەدا درۆزنن

﴿١٥٣﴾ ئایا ئەو لەباتی کوڕدا کچی هەڵبژاردوە بۆ خۆی؟!

﴿١٥٤﴾ ئەوە چیتانە؟ چۆن ئاوا بڕیارێك دەدەن؟

﴿١٥٥﴾ئایا بیر ناکەنەوە؟ واتە: ژیربنو چاك بیر بکەنەوەو چیتر ئەو قسە پڕوپوچانە مەکەنو خۆتانوخەڵکیش فریو مەدەن.

﴿١٥٦﴾ یان ئایا بەڵگەیەکی ڕۆشنتان هەیە لەسەر ئەم بڕیارانەتان؟

﴿١٥٧﴾ جا ئەگەر ڕاست دەکەن لەم قسەنەتاندا ئادەی کتێبی خۆتان بێنن؟ ئاشکرایەکە هیچ کتێبێکیان نیە چونکە درۆو بوختان هەڵدەبەستنو هیچی تریان لا نیە.

﴿١٥٨﴾ ئەوان لەنێوان پەروەردگارو لەنێوان جنۆکەکاندا خزمایەتی دادەنێن، بەڕاستی جنۆکە خۆیان دەزانن کە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانیش ئامادە دەکرێن لە دادگای پەروەرگاردا و هیچ جۆرە پەیوەندیەکیان جگە لە بەندایەتی لەگەڵ (ﷲ)دا نیە ، هەروەکو پەروەردگار خۆی دەفەرموێ:

﴿١٥٩﴾ پاكو بێ عەیبە (ﷲ)و نیازی بە منداڵو خزم نیەو دوورە لەو وەسفەی کە ئەوان دەیکەن، بەڵێ جنۆکەو مرۆڤ ئاوا نمەك نەناسنو درۆی گەورەی ئاوەها دەکەن سەبارەت بەزاتی ﷲ وسیفەتو کردارەکانی.

﴿١٦٠﴾ جگەلە بەندە پاکەکانی ﷲ کە بەڕاستیوبە بێ عەیبی دەیناسنو بە پاكوخاوێنیش بەندایەتی بۆ دەکەن.

﴿١٦١﴾ ئەوسا بەڕاستی ئێوەو ئەوەی کە دەیپەرستن،

﴿١٦٢﴾ ئێوە ناتوانن دژایەتی ﷲ بکەن و لە دەستی تۆڵەو سزای دەرچن، کەسیشتان لەدژی بۆ فریو نادرێت بۆ بت پەرستی.

﴿١٦٣﴾ بەڵێ کەستان پێناخەڵەتێت جگە لەوەی کە دەچێتە ناو دۆزەخەوە، واتە: هەر دۆزەخیتان بۆدەخەڵەتێت. جا فریشتەکان دەڵێن:

﴿١٦٤﴾ لەناو ئێمەدا کەسێك نیە مەگەر پلەو جێگایەکی ئاشکراوتایبەتی خۆی هەیەوناتوانێ لەو پلەو جێگایەی خۆی تێپەڕێت.

﴿١٦٥﴾ خۆ ئێمە هەمیشە ڕیزین لەپێشگای پەروەردگارمانداو ئامادەی بەندایەتین.

(١٦٦) جا بێگومان ئێمە هەر خەریکی تەسبیحاتی پەروەردگارین.

لە سەحیحی موسلم دا هاتووە کە حوزەیفە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی کە فەرمویەتی:{ فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلَاثٍ جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلَائِكَةِ وَجُعِلَتْ لَنَا الْأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِدًا وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُورًا إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ/ئێمە بە سێ شت ڕێزمان لێنراوەوجیاکراوینەوە لە خەڵك : ڕیزەکانی نوێژەکەمان وەکو ڕیزی فریشتەکانەو زەویمان بۆ کراوە بە مزگەوتو خاکەکەیشی پاکۆکەرەوە هەرکاتێ کەئاومان دەست نەکەوێت} .

(١٦٧) جائەگەرچی ئەوان لە پێش هاتنی پێغەمبەردا ﷺ دەیان وت:

(١٦٨) بێگومان ئەگەر کەسێك بێتە لامانو فەرمانی خوامان بۆ باس بکاتو ڕوداوەکانی گەلانی پێشومان بۆ بلێت، ئێمەش بەخۆماندا دەچینەوە.

(١٦٩) بەدڵنیاییەوە ئێمە دەبووین بە بەندە پاکەکانی ﷲ، کەچی لەم بڕیارەیشیاندا درۆیان کرد.

(١٧٠) جا کاتێك کە پێغەمبەریان بۆ هات ئەوان بێباوەڕبون پێی جا بەم زووانە دەزانن چییان بەسەر دێت.

(١٧١) بەراستی بڕیاری ئێمە سەبارەت بەیارمەتی دانی بەندەو پێغەمبەرانمان هەر لەکۆنەوەیە کە فەرمویەتی: خۆمو پێغەمبەرانم سەردەکەوینو دوژمنی ئێمەو پێغەمبەرانمان لەناودەچێت.

(١٧٢) کەوابو بابێگومان بن کە پێغەمبەرانن یارمەتی دراوان.

(١٧٣) جا بێگومان کە هەر سەربازەکانی ئێمەن سەردەکەون لە دنیاو لە دواڕۆژدا ، ئەگەر لەم دنیاش شکست بخۆن لە دواڕۆژدا هەر ئەوانن سەرکەوتو.

ئەوەبو کە قورەیش بەسەرکردایەتی ئەبوجەهلو ئەبوسوفیان دژایەتی پێغەمبەر ﷺ و یارەکانیان کرد تا هاتنە سەر ئەوەیش کە بڕیاری کوشتنیانداو ناچار بەفەرمانی خوا پاش سیانزە ساڵ بانگە وازی یەکخوا پەرستی کۆچی کرد بۆ مەدینەو پاشان چەندین جەنگی خوێناویشیان لەدژی کرد تا سەرەنجام لەساڵی هەشتەمی کۆچیدا ﷲ زاڵی کرد بەسەریاندا، بەڵام ئەو پاش زاڵبونی هەموویانی بەخشی.

(١٧٤) جا تۆئەی محمد ﷺ گوێیان تێ مەدە هەتا ماوەیەك کە کاتی هاتنی سزایانە بە لەناو چونو کوشتنو دەستگیر کردن،

(١٧٥) وەبیریان بینەوەو بۆیان ڕۆشن بکەرەوە ، ئەوسا بەم زوانە ئەوانیش سزاو تۆڵەی خراپەکاری خۆیان دەبینن.

(١٧٦) ئایا بۆ سزاو تۆڵەیەك کە بۆمان داناون پەلە دەکەن؟! وادەزانن کە درۆیە؟ یا پەلە نەکەن دڵنیابن کە دێت.

(١٧٧) ئەوسا کە سزای ئێمە هاتە ناو شارو ماڵەکانیانو یەخەی گرتن ئای چ خراپ بەیانیەکە بەیانی هاتنی سزای ترسێنراوان.

لە فەرمودەدا هاتوە کە ئەنەس وتویەتی: بەیانی زوو پێغەمبەر ﷺ دای بەسەر خەیبەردا جا کاتێك هاتنە دەرەوە بە تەوشێو زەنگنو بێڵەوە بۆ ناو باخو کێڵگەکانیانو چاویان بەو سوپایە کەوت گەڕانەوەو وتیان: بەخوا محمدە، محمدو سوپایەکی گەورە! جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{ اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ / البخاري/ﷲ لە هەموشت گەورەترە، ﷲ لە هەموشت گەورەترە، خەیبەر وێران بو، بێگومان ئێمە هەر کاتێك بۆ تەمێو ژێرکردنی گەلێکی سەرەڕۆ بچینە ناو ماڵەکانیانەوە ئەو کاتە خراپترین بەیانیە بەیانی ترسێنراوان} جارێکی تر پەروەردگار لەم هەلومەرجەی دابەزینی ئەم ئایەتانەدا کە جیهاد لەسەر موسڵمانان پێویست نەکراوە دەفەرموێ:

(١٧٨) تا ماوەیەك وازیان لێ بهێنە.

(١٧٩) وە ببینەو بزانە چی دەکەن، بەم زوانە ئەوانیش بۆ خۆیان دەبینن کە چییان کردووە چییان هاتوەتە ڕێ ،وتراوە"چی بچێنی هەر ئەوە دەروێنەدەکەی"

(١٨٠) پاکو بێ عەیبە پەروەردگاری بە دەسەڵاتت لەو وەسفەی کە مشریکان دەیکەن کەخوا منداڵی هەیەو نیازی بە کەسانێك هەیە کە هەواڵی بەندەکانو دوعاو وتارو کردارەکانیان پێبگەیەنێتو لەڕوی کەسانێك دادەمێنێو تکاکاریان لێوەردەگرێتودەیان شتی تر کە تەنها لە توانای خوا دایە.

(١٨١) سا درود لەسەر تەواوی پێغەمبەران.

(١٨٢) ئەوسا تەواوی سوپاسیش هەر بۆ (ﷲ)یە کە پەروەردگاری جیهانیانە.

## سورەتی صاد (٣٨) (٨٨)

سورەتی صاد کە سورەتی سیو هەشتەمی قورئانە ، لە مەکەدا هاتۆتە خوارەوەو هەشتا و هەشت ئایەتە ، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سیو هەشتەمیشەو پاش سورەتی (القمر) و پێش (الأعراف) دابەزیوە، ئەم سورەتەو سورەتی ئینفتارو لەسەر

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

صٓ وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ ﴿١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى عِزَّةٍ وَشِقَاقٍ ﴿٢﴾ كَمْ أَهْلَكْنَا مِن قَبْلِهِم مِّن قَرْنٍ فَنَادَوا۟ وَّلَاتَ حِينَ مَنَاصٍ ﴿٣﴾ وَعَجِبُوٓا۟ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٌ مِّنْهُمْ ۖ وَقَالَ ٱلْكَٰفِرُونَ هَٰذَا سَٰحِرٌ كَذَّابٌ ﴿٤﴾ أَجَعَلَ ٱلْءَالِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ عُجَابٌ ﴿٥﴾ وَٱنطَلَقَ ٱلْمَلَأُ مِنْهُمْ أَنِ ٱمْشُوا۟ وَٱصْبِرُوا۟ عَلَىٰٓ ءَالِهَتِكُمْ ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَىْءٌ يُرَادُ ﴿٦﴾ مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِى ٱلْمِلَّةِ ٱلْءَاخِرَةِ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا ٱخْتِلَٰقٌ ﴿٧﴾ أَءُنزِلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ مِنۢ بَيْنِنَا ۚ بَلْ هُمْ فِى شَكٍّ مِّن ذِكْرِى ۖ بَل لَّمَّا يَذُوقُوا۟ عَذَابِ ﴿٨﴾ أَمْ عِندَهُمْ خَزَآئِنُ رَحْمَةِ رَبِّكَ ٱلْعَزِيزِ ٱلْوَهَّابِ ﴿٩﴾ أَمْ لَهُم مُّلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۖ فَلْيَرْتَقُوا۟ فِى ٱلْأَسْبَٰبِ ﴿١٠﴾ جُندٌ مَّا هُنَالِكَ مَهْزُومٌ مِّنَ ٱلْأَحْزَابِ ﴿١١﴾ كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ وَعَادٌ وَفِرْعَوْنُ ذُو ٱلْأَوْتَادِ ﴿١٢﴾ وَثَمُودُ وَقَوْمُ لُوطٍ وَأَصْحَٰبُ لْـَٔيْكَةِ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلْأَحْزَابُ ﴿١٣﴾ إِن كُلٌّ إِلَّا كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ عِقَابِ ﴿١٤﴾ وَمَا يَنظُرُ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا صَيْحَةً وَٰحِدَةً مَّا لَهَا مِن فَوَاقٍ ﴿١٥﴾ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا عَجِّل لَّنَا قِطَّنَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْحِسَابِ ﴿١٦﴾

رای هەندێکیش سورەتی نوح سێ سورەتی قورئانن کە ژمارەی سورەتو ژمارەی دابەزینیان یەکێکە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) صاد. پیتێکە لەو پیتانەی کە لەپێش چەند سورەتێکی تری قورئاندا هاتونو ڕاسترین بۆچون ئەوەیە کە زانیاری مانای ئەم وشانە هەر لەلای (ﷲ) یە. سوێند بەم قورئانەی کە خاوەنی بیرو یاد کردنەوەیە. بە خوێندنەوەی سودی لێوەرگرن و بە پەیڕەوکردنیشی ﷲ لە خۆتان ڕازی بکەن. وە ئەو قورئانە مایەی شەرەف و ڕێزەبۆ هەر کەسێك کە پەیڕەوی بکات.

(٢) بەڵام ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن وان لەناو گێژاوی خۆ پەسەندیو لوت بەرزی دا وناڕێکن لەدژایەتی ئەو قورئانەدا هەر یەکەو بەشتێکی دادەنێن. ئینجا پەروەردگار دوژمنانی ئەم قورئانە دەترسێنێو دەفەرموێ:

(٣) زۆر گەلو وڵاتانمان لەپێش ئەواندا بەهۆی دژایەتیانەوە بۆ پێغەمبەرەکیان لەناو بردوە، جا ئەو کاتە کە سزایان بۆ دەهات هاواریان دەکردو پەشیمان دەبونەوە لەو هەڵسو کەوتە ناڕەوایانەیان بەڵام تازە کاتی پەشیمان بونەوەو ڕزگار بون لەدەست دەرچو بو، جا ئێوەش ژیربن با وەکو ئەوانەتان بەسەر نەیەت.

(٤) بەلایانەوە سەیر بوو کە لەخۆیان ترسێنەریان بۆ هات بو جا بێباوەڕان دەیان وت: ئەمە جادوگەرەو زۆر درۆزنە.

(٥) دەیان وت: ئایا وایە کە ئەو لە جیاتی ئەو هەمو بتانە دەڵێ: تەنها یەك خودا هەیە کە شایستەی پەرستن بێت کە ناوی (ﷲ)یە؟ بەڕاستی ئەمە شتێکی سەیرە کە چەندین خودا نەتوانن نیازی ئێمە بەراورد بکەن ، بەڵام یەك خودا بتوانێت نیازی جیهانیان بەراورد بکات؟!

(٦) جا پیاو ماقوڵانیان بەوانی تریان وت: بڕۆنو گوێ بەم قسانە مەدەنو خۆگرن لەسەر پەرستنی خواکانتان بەڕاستی هەر ئەمەیە ویستو ئارەزۆی خوازراولێتان.

(٧)ئێمە ئەمەمان نەبیستوە لە ئایینەکەی تردا، کە ئایینی عیسایە بەڵکو ئەوان دەڵێن: خودا سیانن ئیتر چۆن باوەڕ بەم بکەین کە دەڵێت خوا یەکەو هاوبەشی نیە؟ بەڕاستی ئەمە هەردەست هەڵبەستو دروستکراوە.

(٨) ئایا لەنێوان ئێمەدا لەگەڵ ئەو هەمو سەروەتو سامانو دەسەڵاتەماندا ئەم قورئانە بۆ سەر ئەو کابرای کەمدەست وبێهێزە ڕەوانە کراوە؟! نەخێر ئەمانە تەنانەت لەم قورئانەیشدا هەر لە گوماندابون بەڵکو ئەوان هێشتا سزای منیان نەچەشتوە، ئەگەر بیچەژن جا ئەوسا دەزانن کە ئەمە پێغەمبەرەو ئەم قورئانە ڕاستە بەڵام ئەو زانینە لەو کاتەدا هیچ سودێك بەوان ناگەیەنێت.

(٩) بەڵکو ئایا ئەوان گەنجێنەی بەزەیيو نیعمەتی پەروەردگاری بە دەسەڵاتو بەخشندەی تۆیان لەلایە؟ تا بەکەیفی خۆیان بدەن بەو کەسەی ئارەزۆیان لێیەتیو بەرگری بکەن لەوەی کە ئارەزۆیان لێی نیە؟

(١٠) یان نەخێر (پێیان بڵێ) ئایا هەر هی ئەوانە خاوەنیەتی ئاسمانانو زەوی و ئەوەیش کە لە نێوانیاندایە؟ دەی ئەگەر وایە سا بە پەیژە سەرکەون بۆ ئاسمانو لەوێ نیگا بهێنن بۆ هەر کەسێك کە خۆیان دەیانەوێت، ئاشکرایە کە ئەمەیان لە دەست نایەت.

(١١) بەڵکو ئەوان سەرباز گەلێکی سوکو بێنرخن لەناو ئەو کۆمەڵانەداو لەو شوێنو کاتەدا (کە بۆیان دیاری کراوە)و تێشکاون.

(١٢) لە پێش ئەوانیشدا گەلی نوحو عادو فیرعەونی خاوەن مێخەکان باوەڕیان نەهێنا بەپێغەمبەرانیان.

(١٣) جا سەمودو گەلی لووتو گەلی شوعەیب(کە خاوەنی باخاتی چڕوپڕ بون) ئەوانەش کۆمەڵە خەڵکێك بون هەموویان باوەڕیان نەکرد بە پێغەمبەری سەردەمی خۆیان.

(١٥) ئەوانە هەر هەموویان پێغەمبەرانی خۆیان بەدرۆ خستوە ئەوسا ئەو تۆڵەیەی کە بۆم دانابون هاتە دی بۆیان .

(١٤) ئەوان هەر چاوەڕوانن تا یەك قیژەیان بەسەردا دەکرێت ئیتر بە ئەندازەی دۆشینی وشترێك ماوەیان پێنادرێت.

(١٦) جا ئەوان بە گاڵتەوە وتیان: ئەی پەروەردگارمان پێش هاتنی ڕۆژی حیساب نامەی کرداری خۆمانمان پێبدە. جا بۆیە وایان دەوت چونکە حیسابو کیتابیان بەلاوە درۆ بو، ئینجا پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبەرمانﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٧) ئەی محمدﷺ خۆ بگرە لەسەر ئەو دەمەدەمەو قسە ناشرینانەیانو باسی داوودی خاوەن دەسەڵاتی بەندەی ئێمە عليه السلامبکەو بیری لێبکەرەوە کە ئەو لە هەمو تەنگو چەڵەمەیەکدا هەر ڕوی لە ئێمە دەکردوو چاوی لە یارمەتی ئێمە بو.

(١٨) بێگومان ئێمەش چیاکانمان بۆی مۆتی کرد بو، جا بە ئێواران‌و بە بەیانیان لەگەڵ ئەودا تەسبیحاتیان دەکرد.

(١٩) خۆ باڵندەیشمان بۆی مۆتی کردو هەموویان لەلای کۆ دەبونەوە و بە یادو تەسبیحاتیالله رویان هەرلەو زاتە بو.

(٢٠) جا دەسەڵاتی چاکو بەهێزمان پێداو پێغەمبەریمان پێ بەخشیو تێمان گەیاند کە چۆن قسەی ڕاستو ناڕاست لەیەك جیا بکاتەوەو چۆن قسەکانی خۆیشی وابێ کە خەڵکی بە جوانی لە مەبەستی تێبگات، پێغەمبەرمان ﷺ لەبارەی داوودەوەعليه السلام دەفەرموێ:{ أحَبَ الَصلَاة الى الله صَلاةُ داود وأحَبَ الصِيَامِ الى اللهِ صِيامُ داوُدَ، كَانَ يَنَامُ نِصفَ اللَيلِ وَيَقُومُ ثُلثَهُ وَيَنَامُ سُدُسَهُ وَكَانَ يَصُومُ يَوماً وَ يُفطِرُ يَومًا( وَلَا يَفِرُّ اِذَا لاقَى) / متفق عليه/ واتە : خۆشەویسترین نوێژ لەلای الله نوێژی داوودەو خۆشەویسترین ڕۆژیش بەلایەوە هەر ڕۆژی داوودە کە ئەو تا نیوەی شەو دەخەوتو سێ یەکی شەو بەندایەتیو نوێژی دەکردو شەش یەکی شەو دەخەوتەوە ورۆژێ ڕۆژوی ئەگرت ورۆژێکی نەدەگرت (وەکاتێ لەگەل دوژمندا ڕوبەڕو ببوایەوە هەرگیز پشتی تێنەدەکرد)/ ئەوەی نێو دوو کەوانە کە لەلای ترمزییەوئەلبانیش بەسەحیحی داناوە. ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٢١) ئایا هەواڵی ئەو خاوەن کێشانەت پێنەگەیوە کاتێك کە بەبێ تەقەوڕەقەلە دیواری میحراوبەوە سەرکەوتن ،

ٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَا دَاوُۥدَ ذَا ٱلۡأَيۡدِۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ (١٧) إِنَّا سَخَّرۡنَا ٱلۡجِبَالَ مَعَهُۥ يُسَبِّحۡنَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِشۡرَاقِ (١٨) وَٱلطَّيۡرَ مَحۡشُورَةٗۖ كُلّٞ لَّهُۥٓ أَوَّابٞ (١٩) وَشَدَدۡنَا مُلۡكَهُۥ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحِكۡمَةَ وَفَصۡلَ ٱلۡخِطَابِ (٢٠) ۞ وَهَلۡ أَتَىٰكَ نَبَؤُاْ ٱلۡخَصۡمِ إِذۡ تَسَوَّرُواْ ٱلۡمِحۡرَابَ (٢١) إِذۡ دَخَلُواْ عَلَىٰ دَاوُۥدَ فَفَزِعَ مِنۡهُمۡۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ خَصۡمَانِ بَغَىٰ بَعۡضُنَا عَلَىٰ بَعۡضٖ فَٱحۡكُم بَيۡنَنَا بِٱلۡحَقِّ وَلَا تُشۡطِطۡ وَٱهۡدِنَآ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلصِّرَٰطِ (٢٢) إِنَّ هَٰذَآ أَخِي لَهُۥ تِسۡعٞ وَتِسۡعُونَ نَعۡجَةٗ وَلِيَ نَعۡجَةٞ وَٰحِدَةٞ فَقَالَ أَكۡفِلۡنِيهَا وَعَزَّنِي فِي ٱلۡخِطَابِ (٢٣) قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗاۤ وَأَنَابَ ۩ (٢٤) فَغَفَرۡنَا لَهُۥ ذَٰلِكَۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ (٢٥) يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ (٢٦)

(٢٢) ئەو کاتەی کە چونە لای داوود جا ئەو ترسا لێیان کە چۆن ئەمانە توانیویانە بەناو ئەو هەمو یاساوڵانەدا لە دیوارەوە سەرکەونو بێنە لای، جا ئەوانیش کە هەستیان بەمە کرد وتیان: مەترسەو دوو کەسین کێشەمان هەیە کە هەندێکمان ستەممان لە هەندێکمان کردوە ، جا تۆش بەڕاستی لەنێوانماندا بڕیار بدەو ستەم لە کەسمان مەکەو ڕاستە ڕێگامان پیشان بدە

(٢٣) بێگومان ئەمە برامەو نەوەدو نۆ سەر مەڕی هەیەو من یەك تاکە مەڕم هەیە جا ئەو وتی: ئەو دانەیش بدە بەمنو لە قسەدا بەسەر مندا زاڵبوو تاکە مەڕەکەیشمی برد.

(٢٤) داوود عليه السلاموتی: بەڕاستی بە داواکردنی ئەو تاکە مەڕەی تۆو لکاندنی بە مەڕەکانی خۆیەوە ستەمی لێکردویتو بێگومان زۆرێك لە هاوبەشەکان هەندێکیان لە هەندێکیان ستەم دەکەن جگە لەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوەو ئەمانەش کەمن، جا داوود دڵنیا بو کە ئێمە تاقیمان کردوەتەوە لەبەر ئەوە داوای لێ بوردنی کرد لە پەروەردگاری‌و بەگەردنکەچیەوەسەری نایە سەر خاك (سوجدەی برد)و پەشیمان بویەوە لەو بڕیارە بەپەلەیەی کە لەگەل ئەو دوو خاوەن کێشەدا دای چونکە دەبوو قسەیشی لەوی تریان وەربگرتایە ، ئینجا بڕیاری بدایە، لیرەدا شتی زۆر لەم بارەوە وتراوە بەلام لە ڕۆحی ئایینو ڕواڵەتی ئایەتەکان من ئاوەهای بۆ دەچم والله اعلم.

وَمَا خَلَقۡنَا ٱلسَّمَآءَ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا بَٰطِلٗاۚ ذَٰلِكَ ظَنُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴿٢٧﴾ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلۡمُفۡسِدِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ نَجۡعَلُ ٱلۡمُتَّقِينَ كَٱلۡفُجَّارِ ﴿٢٨﴾ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٣٠﴾ إِذۡ عُرِضَ عَلَيۡهِ بِٱلۡعَشِيِّ ٱلصَّٰفِنَٰتُ ٱلۡجِيَادُ ﴿٣١﴾ فَقَالَ إِنِّيٓ أَحۡبَبۡتُ حُبَّ ٱلۡخَيۡرِ عَن ذِكۡرِ رَبِّي حَتَّىٰ تَوَارَتۡ بِٱلۡحِجَابِ ﴿٣٢﴾ رُدُّوهَا عَلَيَّۖ فَطَفِقَ مَسۡحَۢا بِٱلسُّوقِ وَٱلۡأَعۡنَاقِ ﴿٣٣﴾ وَلَقَدۡ فَتَنَّا سُلَيۡمَٰنَ وَأَلۡقَيۡنَا عَلَىٰ كُرۡسِيِّهِۦ جَسَدٗا ثُمَّ أَنَابَ ﴿٣٤﴾ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴿٣٥﴾ فَسَخَّرۡنَا لَهُ ٱلرِّيحَ تَجۡرِي بِأَمۡرِهِۦ رُخَآءً حَيۡثُ أَصَابَ ﴿٣٦﴾ وَٱلشَّيَٰطِينَ كُلَّ بَنَّآءٖ وَغَوَّاصٖ ﴿٣٧﴾ وَءَاخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي ٱلۡأَصۡفَادِ ﴿٣٨﴾ هَٰذَا عَطَآؤُنَا فَٱمۡنُنۡ أَوۡ أَمۡسِكۡ بِغَيۡرِ حِسَابٖ ﴿٣٩﴾ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلۡفَىٰ وَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴿٤٠﴾ وَٱذۡكُرۡ عَبۡدَنَآ أَيُّوبَ إِذۡ نَادَىٰ رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَسَّنِيَ ٱلشَّيۡطَٰنُ بِنُصۡبٖ وَعَذَابٍ ﴿٤١﴾ ٱرۡكُضۡ بِرِجۡلِكَۖ هَٰذَا مُغۡتَسَلُۢ بَارِدٞ وَشَرَابٞ ﴿٤٢﴾

(٢٥) جا لەو بارەوە لێیخۆشبووین بە بێگومان ئەو لە نزیکەکانی ئێمەیەو جوانترین پلەو مەقامی هەیە لەڕۆژی دواییدا. لێرەدا سوجدە بردن باشە بەڵام زۆر داکۆکی لەسەر نەکراوە بۆیە زانایان بەلایانەوە وایە لە نوێژدا لەم جێگایەدا سوجدە نابرێت. ئینجا پەروەردگارمان ئەو باسەی داوود(عليه السلام) دێنێتە بەرچاوو رووی تێدەکاتو دەفەرموێ:

(٢٦) ئەی داوود بێگومان ئێمە لەم زەویەدا تۆمان پاش خەڵکانی تر داناوەو هێزو دەسەڵاتمان پێداویت، جا تۆش لە نێوان خەڵکدا بەراستی بڕیار بدەو پەیڕەوی هەواو ئارەزوات نەکەیت ئەوسا ئەوە لە ڕێگای اللَّه لات دەدات بێگومان ئەو کەسانەی کە لە ڕێگای اللَّه لادەدەن سزایەکی توندیان بۆ هەیە چونکە ڕۆژی حیسابیان لەبیر چوەتەوە. وتراوە کە وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك بە ئیبراهیم ی ئەبو زورعەی وتوە: کە تۆ پەڕاوەکانی ترت خوێندوەتەوەو قورئانیش ئایا دەکرێت کە خەلیفە لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکرێت؟ دەڵێت وتم: ئەی پێشەوای باوەڕداران قسە بکەم بێترس: وتی: بڵێو مەترسە، وتم ئەی پێشەوای باوەڕداران ئایا تۆ لەلای اللَّه بەڕێزتری لە داود؟ کە اللَّه پێغەمبەرایەتیو خەلافەتی پێدابوو پاشانیش هەڕەشەی لێدەکات و لە پەڕاوەکەی خۆیدا ئەم داستانەی تۆمار کردوەو ئینجا ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ﴾ ئینجا پەروەردگارمان تێمان دەگەیەنێت کە ئەم جیهانە بە بێهوودە دروست نەکراوە بەڵکو حیسابو کیتاب هەیەو دەفەرموێ:

(٢٧) جا خۆ ئێمە ئاسمانو زەویو ئەوەی کە لە نێوانیاندایە بە بێهوودە دروستمان نەکردوە، ئەوە گومانی ئەو کەسانەیە کە خوا نەناسن، وای بۆ ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن بۆ ئەو ئاگرەی کە تێی دەخرێن،

(٢٨) ئایا لای ئێمە وەکو یەکن ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوەو ئەو کەسانەش کە لەم زەویدا خراپەکارن؟ ئایا پارێزکارو گەنە کێڵ وەکو یەك حیساب دەکەین؟ نەخێر شتی وانیەو بۆ هەر کامیان جێگاو پاداشتێکی تایبەت بە کردارەکانی خۆیان هەیە، ئینجا جارێکی تر سرنجمان بەرەو ئەم پەڕاوە بەنرخە ڕادەکێشێتو دەفەرموێ:

(٢٩) ئەمە پەڕاوێکە بەفەڕو پیرۆزە کە ئێمە دامان بەزاندوە بۆ لای تۆ تا لە نیشانەکانی ورد ببنەوەو تا خاوەن عەقڵەکان پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرن، ئینجا پەروەردگار ئەمان باتەوە بۆ داستانی داوودو سلێمانی کوڕیو دەفەرموێ:

(٣٠) بەخەڵات سلێمانمان بە داود بەخشی بێگومان سلێمان باشترین بەندەبو بێگومان ئەو هەمیشە بە زمانو بە دڵ لەگەڵ ئێمەدابو.

(٣١) باس بکە ئەو کاتەی ئێوارە کە ئەسپانی ڕەسەنو چاك لەبەر چاوی سلێمان ڕاگیرا و بە تەماشا کردنیان ڕۆژی بردەسەر.

(٣٢) جا وتی: خۆشەویستی ئەم ئەسپو ماڵەم لایدام لە یادی پەروەردگارم تا ڕۆژم لێ ئاوابو.

(٣٣) بیانهێننەوە بۆم جا بە شمشێر هات بە قاچو ملیانداو هەموی سەربڕینو کردی بە خێر لەتۆڵەی ئەو چەند ساتەی کە خەریکبو بەوانەوەو یادی (اللَّه)ی لە بیر چوبویەوە.(لێرەدا چەندین مانای تر باسکراوە ئێمە ئەوەمان هەڵبژارد کە بە نزیکترمان زانی ، والله اعلم).

(٣٤) بە حەقیقەت ئێمە سلێمانمان تاقی کردەوەو لاشەیەکی بێگیانمان خستە سەر کورسیەکەیەوە، پاشان ئەو هەر ڕووی لە ئێمە کردوو هەر بۆ لای ئێمە گەڕایەوە .لەفەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: سلێمان وتی: ئەم شەو ئەچمە لای هەر نەوەد خێزانم وهەر یەکەی کوڕێکی ئەبێت

وجیهاد ئەکەن لەڕێگای خوادا، جا هاوڕێکەی پێی وت: بلّی إن شاءالله، جا ئەویش ئەو زیکرەی لە بیری کردو نەیوت ئینجا بەسەر هەمو ژنەکانیدا گەڕا بەڵام تەنها یەك ژنی سکی پەیدا کردکە ئەویش ناتەواو بو، سوێند بەو کەسەی کە گیانی محمدی بەدەستە ئەگەر إن شاءالله ی بکردایە نەوەد منداڵی ئەبوو لەڕێگای خودایشدا جیهادیان دەکرد.

(٣٥) سلێمان وتی: ئەی پەروەرگارم لێم ببورەو دەسەڵاتێکی وەهام پێببەخشە کە نەشێ بە کەسی تری بدەیت لەپاش من، بێگومان کە تۆ هەر خۆتیت بەخشندە.

لە فەرمودەیەکدا هاتووە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی :{إنَّ عِفْريتاً مِنَ الجِنّ تَفَلَّتَ عَلَيَّ البَارِحَةُ–أو كَلِمَةً نَحْوَهَا– لِيَقْطَعَ عَلَيَّ الصَّلاَةَ، فَأمْكَنَنِي اللهُ مِنْهُ، وَأرَدْتُ أنْ أرْبُطَهُ إلَى سَارِيَةٍ مِنْ سَوارِي المَسْجِدِ حَتَّى تُصْبِحُوا وَتَنْظُرُوا إلَيْهِ كُلُّكُمْ. فَذَكَرْتُ قَوْلَ أخِي سُلَيْمَانَ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱغۡفِرۡ لِي وَهَبۡ لِي مُلۡكٗا لَّا يَنۢبَغِي لِأَحَدٖ مِّنۢ بَعۡدِيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ ﴾ فَرَدَّهُ اللهُ خَاسِئًا /الجامع الصغير صححه الالباني/ واتە: بێگومان جنوکەیەکی زەبەلاح کتوپڕ ئەم ئێوارە هێرشی بۆ هێنام(یان وشەیەکی وەکو ئەوە) بۆ ئەوەی نوێژەکەم لێ ببڕێت، بەڵام الله زاڵی کردم بەسەریداو گرتم و ویستم بیبەستم بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی ئەم مزگەوتەوە تا ڕۆژ دەکەنەوەو هەموتان ببینن جا قسەی سلێمانی برام کەوتەوە بیر کە وتی ﴿ئەی پەروەردگارم دەسەڵاتێکی وام پێببەخشە کە نەشێ بە کەسی تری پاش من ببەخشیت﴾ لەبەرئەوە ئەو جنۆکەیە بێ ئەوەی شتێکی دەست کەوێت خوا گەڕاندیەوە} . جا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٣٦) ئینجا ئێمە بامان بۆی ڕام کرد کە بە فەرمانی ئەو بەنەرمی دەڕۆیشت بۆ هەر جێگایەك کە مەبەستی بوایە.

(٣٧) جا ئەو شەیتانانەیشمان بۆ رامکرد کە هەمویان بینا دروستکەرو مەلەوان بون بۆ ئەنجامدانی فەرمانەکانی.

(٣٨) ئەوسا ئەوانی تر کەفەرمانبەرداریان بۆ نەدەکرد پێکەوە بە زنجیر بەندکراو بونو لەژێر دەستی ئەودا بون.

(٣٩) پێمان وت: ئەمە بەخششی ئێمەیە بۆت ، جا وتمان: تۆ بە کەیفی خۆت بکە دەی بەخشی یان بۆ خۆتی هەڵدەگریت بێ حیسابە.

وَوَهَبۡنَا لَهُۥٓ أَهۡلَهُۥ وَمِثۡلَهُم مَّعَهُمۡ رَحۡمَةٗ مِّنَّا وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٤٣﴾ وَخُذۡ بِيَدِكَ ضِغۡثٗا فَٱضۡرِب بِّهِۦ وَلَا تَحۡنَثۡۗ إِنَّا وَجَدۡنَٰهُ صَابِرٗاۚ نِّعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٞ ﴿٤٤﴾ وَٱذۡكُرۡ عِبَٰدَنَآ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ أُوْلِي ٱلۡأَيۡدِي وَٱلۡأَبۡصَٰرِ ﴿٤٥﴾ إِنَّآ أَخۡلَصۡنَٰهُم بِخَالِصَةٖ ذِكۡرَى ٱلدَّارِ ﴿٤٦﴾ وَإِنَّهُمۡ عِندَنَا لَمِنَ ٱلۡمُصۡطَفَيۡنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴿٤٧﴾ وَٱذۡكُرۡ إِسۡمَٰعِيلَ وَٱلۡيَسَعَ وَذَا ٱلۡكِفۡلِۖ وَكُلّٞ مِّنَ ٱلۡأَخۡيَارِ ﴿٤٨﴾ هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴿٥١﴾ ۞ وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ أَتۡرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾ هَٰذَاۚ وَإِنَّ لِلطَّٰغِينَ لَشَرَّ مَـَٔابٖ ﴿٥٥﴾ جَهَنَّمَ يَصۡلَوۡنَهَا فَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ﴿٥٦﴾ هَٰذَا فَلۡيَذُوقُوهُ حَمِيمٞ وَغَسَّاقٞ ﴿٥٧﴾ وَءَاخَرُ مِن شَكۡلِهِۦٓ أَزۡوَٰجٌ ﴿٥٨﴾ هَٰذَا فَوۡجٞ مُّقۡتَحِمٞ مَّعَكُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِهِمۡۚ إِنَّهُمۡ صَالُواْ ٱلنَّارِ ﴿٥٩﴾ قَالُواْ بَلۡ أَنتُمۡ لَا مَرۡحَبَۢا بِكُمۡۖ أَنتُمۡ قَدَّمۡتُمُوهُ لَنَاۖ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرَارُ ﴿٦٠﴾ قَالُواْ رَبَّنَا مَن قَدَّمَ لَنَا هَٰذَا فَزِدۡهُ عَذَابٗا ضِعۡفٗا فِي ٱلنَّارِ ﴿٦١﴾

(٤٠) جا بێگومان ئەو لەلای ئێمە پلەو پایەی بەرزو جێگای جوانی هەیە، ئینجا پەروەردگار باسی ئەیوب عليه السلام بەکورتی دەکاتو دەفەرموێ:

(٤١) باسی بەندەی ئێمە ئەیوب عليه السلام بکە بۆ گەلەکەت ئەو کاتەی کە بانگی کردە پەروەردگاریو وتی: بەڕاستی من شەیتان دوچاری نارەحەتیو سزای کردوم.

(٤٢) ئێمەیش پێمان وت: پێی خۆت بکوتە بە زەویدا، ئەویش پێی خۆی بە زەویدا کوتیو کانیاوێك پەیدا بو، جا وتمان: ئەمە بۆ خۆ شۆردن دەست دەداتو ساردەو بۆ خواردنەوەش دەبێت، کە خۆتی پێبشۆرەو لێشی بخۆرەوە . بەڵێ بە خواردنەوەی ئەو ئاوەو خۆ شۆردن لێی ئەیوب لەو نەخۆشیە چاك بویەوە.

(٤٣) ئەوسا ئێمە هەمو خاوخێزانیو لەگەڵ ئەوانیشدا ئەوەندەی تریشمان پێبەخشی کە ئەمە سۆزێکی ئێمە بو بۆی لەسەر ئەو خۆگریەیو ئامۆژگاریشە بۆ ئەوانەی کە خاوەنی ژیرین، جا ئەیوب عليه السلام لەم ماوە زۆرەی کە دوچاری نخۆشی ببو هەر تەنها خێزانی بۆ مایەوەو خزمەتی دەکرد، ئەوەبو ڕۆژێك کە بەهۆی هەر شتێکەوەبو لێی تورە بو وتی: ئەگەر الله شیفام بدات سەد

وَقَالُوا۟ مَا لَنَا لَا نَرَىٰ رِجَالًا كُنَّا نَعُدُّهُم مِّنَ ٱلْأَشْرَارِ ﴿٦٢﴾ أَتَّخَذْنَٰهُمْ سِخْرِيًّا أَمْ زَاغَتْ عَنْهُمُ ٱلْأَبْصَٰرُ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ذَٰلِكَ لَحَقٌّ تَخَاصُمُ أَهْلِ ٱلنَّارِ ﴿٦٤﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ مُنذِرٌ ۖ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا ٱللَّهُ ٱلْوَٰحِدُ ٱلْقَهَّارُ ﴿٦٥﴾ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفَّٰرُ ﴿٦٦﴾ قُلْ هُوَ نَبَؤٌا۟ عَظِيمٌ ﴿٦٧﴾ أَنتُمْ عَنْهُ مُعْرِضُونَ ﴿٦٨﴾ مَا كَانَ لِىَ مِنْ عِلْمٍۭ بِٱلْمَلَإِ ٱلْأَعْلَىٰٓ إِذْ يَخْتَصِمُونَ ﴿٦٩﴾ إِن يُوحَىٰٓ إِلَىَّ إِلَّآ أَنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٧٠﴾ إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى خَٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن طِينٍ ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَٰجِدِينَ ﴿٧٢﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٧٣﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ ٱسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾ قَالَ يَٰٓإِبْلِيسُ مَا مَنَعَكَ أَن تَسْجُدَ لِمَا خَلَقْتُ بِيَدَىَّ ۖ أَسْتَكْبَرْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْعَالِينَ ﴿٧٥﴾ قَالَ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْهُ ۖ خَلَقْتَنِى مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُۥ مِن طِينٍ ﴿٧٦﴾ قَالَ فَٱخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٧٧﴾ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٧٨﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِىٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿٧٩﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ ﴿٨٠﴾ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْوَقْتِ ٱلْمَعْلُومِ ﴿٨١﴾ قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٨٢﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ ٱلْمُخْلَصِينَ ﴿٨٣﴾

دارت لێدەدەم ، جا پەروەردگاری میهرەبان هەر بۆ خۆی لەسەر ئەو ئافرەتە هاتە جواب و بە ئەیوبی  پاش چاك بونەوە فەرمو:

(٤٤) جا بەدەستی خۆت چەپکێك گیا بگرە، جا بەوە لە خێزانەکەت بدەو سوێندی خۆت مەخەو ئازاریش بەو مەگەیەنە بەڕاستی ئەیوبمان دی کە خۆگرو بە حەوسەڵەو باشترین بەندەمان بو ، بێگومان ئەو هەمیشە ڕووی لە ئێمە بو دیسان پەروەردگارمان. بەکورتی باسی چەندین پێغەمبەری تر دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٥) جا باسی بەندەکانی ئێمە ئیبراهیمو ئیسحاقو یەعقوب(سەلامی خوایان لێبێ) بکە کە خاوەن دەسەڵاتو ڕۆشن بیربون.

(٤٦) بەڕاستی ئێمە ئەوانمان هەڵبژاردبو بە هەڵبژاردنێك بۆ وەبیر هێنانەوەی ڕۆژی دوایی واتە هەمیشە ئامۆژگاری کەری خەڵکبونو دوارۆژیان دەخستە بیری خەڵکەوە.

(٤٧) جابێگومان ئەوانە لەلای ئێمە لە هەڵبژێرراوە زۆر چاکەکان بون، چونکە هەمویان پێغەمبەرو پەیام ڕەسێنی ﷲ بون.

(٤٨) ئەوسا ئیسماعیلو یەسوعو زولکیفلیش(سەلامی خوایان لێبێ)  باس بکە بۆ گەلەکەت تاسودیان لێوەرگرن خۆ ئەوان هەمویان لە مرۆڤە هەرە چاکەکانمان بون. ئینجا دەچێتەوە سەر ئەم قورئانەو باسی بەهەشتو دۆزەخو کێشەی چاکەو خراپان وبەکورتیو دەفەرموێ:

(٤٩) ئەمە ئامۆژگاریەو بێگومان جێگای جوان هەیە بۆ پارێزکاران.

(٥٠) باخچە گەلی دانیشتن کە دەرگاکانی کراوەیە بۆیان.

(٥١) لەناویدا شانیان داداوەو تێیدا میوەی زۆر بانگ دەکەنو خواردنەوەی زۆریش. هەرشتێ ئارەزۆ بکەن بۆیان هەیە.

(٥٢) جا لەلایانن ئافرەتانێکی قەشەنگ و زۆر کە هەمیشە چاویان لە مێردیانەو هاوتەمەنیانن.

(٥٣) ئەمە ئەوەیە کە بەڵێنتان پێدەدرێت بۆ ڕۆژی حیسابو کیتاب.

(٥٤) بێگومان ئەمە رۆزی ئێمەیە بۆتانو هەرگیز دوا هاتنی بۆ نیە.

(٥٥) ئەمە بزانە بۆچاکانو بێگومان بۆ یاخیوسەرکەشانیش خراپترین جێگا هەیە،

(٥٦) دۆزەخە کە دەچنە ناویەوە ئای کە خراپترین جێگایە دۆزەخ،

(٥٧) ئەمەش بزانەو ئەوسا با بچێژن ئاوی داخو خوێنو زوخی دۆزەخیان.

(٥٨) وەسزای تریش لە وێنەی ئەو کە چەندین جۆرە.

(٥٩) ئەمیشە تاقمێکی ترن وەکو خۆتان وبەزۆر لەگەڵ ئێوەدەخرێنە ناوئاگر جا پێیان دەڵێن: بەخێر نەیەن بێگومان ئەوان خۆیشیان دەچنە ناو ئاگرەوە،

(٦٠) بە زۆر لەگەڵخراوانیش وەڵامیان  دەدەنەوەو دەڵێن: نە، ئێوە بەخێر نەیەن چونکە هەر ئێوە بون کە سەرتان لە ئێمە تێکداو ئەم خوا نەناسیەتان کرد بە پیشە بۆمان ئای بەڕاستی ئەم جێگایە خراپترین ئارامگایە بۆ هەمومان.

(٦١) دەڵێن: ئەی پەروەردگارم هەر کەسێك ئەم بێدینیو خوا نەناسیەی گەیاند بە ئێمەو ئێمەی بەم ڕۆژە ڕەشە گەیاند ، سا تۆ سزای بۆ چەند قات کەرەوە لەناو ئاگردا. بەڵێ بەڕاستی سزا بۆ هەمویان چەند قات دەکرێتەوە، ئەمانە لە دنیادا دژایەتی پەروەردگاریان دەکردو هەر کەس ناوی دەبرد بەسوك تەماشایان دەکرد بەڵام وا ئێستا بەقسەو گوفتاریان هەر (ربنا ،ربنا)یانەو دەیانەوێت لەوێدا بەم وشە جوانە خۆیان پێش بخەنو فرتو

فێڵێك لە ﷲ بکەن! دڵنیا بن کە ئەم فرتو فێڵو وشە شیرینە لەوێدا بە کەڵکیان نایەت، بەڵێ، خوا نەناسان لە دنیادا خۆیان بە پیاو چاكو ئاشتی خوازو مرۆڤ دۆستو ماف پاریز دەزانن ، بەڵام موسڵمانان بە خراپە کارو تۆقێنەرو دژ بەمرۆڤ لە قەڵەم دەدەن، ئەوەتا چاوەڕێن کە لە ڕۆژی قیامەتیشدا هەروا بێ کە خۆیان دایانناوە، جا تەماشا بکەنو بزانن چی دەڵێن.

(٦٢) خۆ دەڵێن: ئەوە چیمانە بۆ ئێمە لەناو ئەم دۆزەخەدا ئەو پیاوانە نابینین کە ئێمە لە دنیادا بە خراپەکارمان دەژماردن؟!

(٦٣) ئایا ئێمە گاڵتەو درۆمان لەگەل دەکردن یان ئەوانیش هەر لێرە لەناو دۆزەخدان بەڵام بەچاو نایان بینین؟جا بەم شێوەیە دڵخۆشی خۆیان دەکەن بەڵام زۆر ناخایەنێت کە دەزانن ئەوان وان لەناو بەهەشتو خۆشیو شادمانیداو ئەپاڕێنەوە لێیان کە کەمێ خواردن یان قومە ئاوێکیان بۆ ڕەوانە بکەن بەڵام ئەوان وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن: بێگومان ﷲ ئەم خواردنو ئاوەی قەدەغەکردوە لە خوانەناسان، لێرەشﷲ دەفەرموێ:

(٦٤) بێگومان ئەوە ڕاستەو کێشەی خەڵکی ناو ئاگری دۆزەخە.

(٦٥) ئەی محمد ﷺ بڵێ: من هەر ترسێنەرێکم بۆ ئێوە نە هیدایەتو نە سزاو نە لێخۆشبون هیچکام بەدەست من نیە، وە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەش نیە بێجگە لە ﷲ، کە یەکەو هاوبشی نیەو زاڵە بەسەر هەمو شتێکدا.

(٦٦) کە ئەو زاتە پەروەردگاری ئاسمانو زەویو ئەوەی کە لەنێوانیاندایە، کە دەسەڵاتدارو لێبوردەیە.

(٦٧) ئەی محمد ﷺ بڵێ: ئەم ناردنەی منو پەیامەکەم کە قورئانە هەواڵێکی زۆرگەورەیە،

(٦٨) بەڵام ئێوە پشتی تێدەکەنو ناتانەوێ خۆتان خۆشبەخت بکەن!

من هیچ زانیاریەکم نیە بەو کێشە گەورانەی کە لە سەری سەرەوە سەبارەت بە ئادەمو شەیتانو دۆزەخیو بەهەشتییان ڕویداوە. واتە پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ من غەیبزان نیم.

(٧٠) وەحی نەکراوەتەلای من مەگەر بۆ ئەوەی کە من ترسێنەرێکی ئاشکرا بم بۆ تان ڕاستو ناڕاستتان بۆ جیا بکەمەوەو سەرەنجامی هەردووتان پێ بڵێم. جارێکی تر پەروەردگار بەسەرهاتی ئادەم (سەلامی خوای لێبێ)و شەیتانی نەفرین لێکراومان بۆ باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٧١) باس بکە ئەو کاتەی کە پەروەردگاری تۆ وتی: بە فریشتەکان من دەمەوێت بەشەرێك لە قوڕ دروست بکەم

قَالَ فَٱلۡحَقُّ وَٱلۡحَقَّ أَقُولُ ﴿٨٤﴾ لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنۡهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٨٥﴾ قُلۡ مَآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ مِنۡ أَجۡرٖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلۡمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾

## ٣٩ سُورَةُ الزُّمَرِ ٧٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَكِيمِ ﴿١﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ فَٱعۡبُدِ ٱللَّهَ مُخۡلِصٗا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿٢﴾ أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ﴿٣﴾ لَّوۡ أَرَادَ ٱللَّهُ أَن يَتَّخِذَ وَلَدٗا لَّٱصۡطَفَىٰ مِمَّا يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ سُبۡحَٰنَهُۥۖ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّارُ ﴿٤﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ بِٱلۡحَقِّۖ يُكَوِّرُ ٱلَّيۡلَ عَلَى ٱلنَّهَارِ وَيُكَوِّرُ ٱلنَّهَارَ عَلَى ٱلَّيۡلِۖ وَسَخَّرَ ٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَۖ كُلّٞ يَجۡرِي لِأَجَلٖ مُّسَمًّىۗ أَلَا هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفَّٰرُ ﴿٥﴾

(٧٢) جا هەرکاتێك ڕێكو پێکم کردو لەو گیانەی کەخۆم دەزانم چیەو چۆنە فوم پێدا کرد ئەو کاتە ئێوەش سوجدەی ڕێزو گەورەیی بۆ ببەن.

(٧٣) بەڵێ پەروەردگار ئادەمی لەقوڕ دروستکردو گیانی تێکرد، جا هەمو فریشتەکان سوجدەیان بۆبرد

(٧٤) جگە لە ئیبلیس کە خۆی بە زلزانیو لە خوا نەناسان بو سوجدەی بۆ ئادەم نەبردو فەرمانی خوای باڵا دەستی شکاند.

(٧٥) فەرموی: ئەی شەیتان چی وای لێ کردی کە تۆ سوجدە نەبەی بۆ ئەوەی کە بە دەستی خۆم دروستم کردوە، خۆت بە گەورە زانی یان تۆ لە پایە بەرزان بویتو پێت شەرمە سوجدەی بۆ ببەیت؟

(٧٦) وتی: من چاکترم لە ئەو، منت لە ئاگر دروستکردوەو ئەوت لە قوڕ دروستکردوە.

(٧٧) فەرموی: دەی دەرچوە لە بەهەشتدا ئەوسا ئیترتۆ تارێنراوو دورخراوەیت لەنازو نیعمەتی بەهەشتی من بۆهەمیشە.

(٧٨) بێگومان نەفرینی من لەسەر تۆیە هەتا ڕۆژی قیامەت کە ڕۆژی بەرنامەو ئایینە، خۆ هەموکەسیش بەگوێرەی ئەو بەرنامەو ئایینەی کە دوای کەوتوە حیسابی لەگەڵدا دەکرێ.

(٧٩) وتی: ئەی پەروەردگارم سا مۆڵەتم بدەو مەمکوژە هەتا ڕۆژی زیندوکرنەوەوقیامەت.

(٨٠) فەرموی: ئەوسا تۆ لەوانەی کە ماوەیان پێدەدرێ.

(٨١) بەڵام ئەو ماوەیە کە پێت دەدرێ بۆرۆژی زیندوبونەوە نیە بەڵکو هەتا کاتی زانراوە کە کاتی کۆتای هاتنی ئەم ژیانەی مرۆڤەلەم جیهانەدا.

(٨٢) وتی: سا بە گەورەیت قەسەم هەمویان سەرلێدەشێوێنم‌و لەبەندایەتیت لایان دەدەم.

(٨٣) جگە لەو بەندانەت کە بە پاکی بەندایەتیت دەکەن‌و ڕاستو دڵسۆزن لەئەنجامدانی فەرمانەکانتا. جاڤەی باوەڕدار ئاگاداری کارو کۆششی خۆت بە چونکە ئەگەر لە بەندایەتیدا خۆت یەك لانەکەیتەوە بۆ خوا ئەو کردارانەت لێوەرناگرێت ولە فرۆفێڵی شەیتان پارێزراو نیت.

(٨٤) فەرموی: ئەوسا ئەمە ڕاستە هەر ڕاستیش دەڵێم.

(٨٥) بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆو لە ئەوانەی کە پەیڕەوی تۆ دەکەن هەر هەموتان .

(٨٦) ئەی محمدﷺ بڵێ: لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە من داوای هیچ پاداشتێك لە ئێوە ناکەم‌و لەوانەش نیم کە درۆ بەدەم اللهوە دەکەن.

(٨٧) بێگومان ئەم قورئانە هەر پەندو ئامۆژگارییە بۆ جیهانیان.

(٨٨) جا بەدڵنیاییەوە پاش کەمێك ئەم هەواڵە دەزانن ،واتە: پاش مردن هەموشتتان بۆ دەردەکەوێت. جا لەوێدا بیر ئەکەنەوە کە بیرکرنەوەیش لەو کاتەدا هیچ سودێکی نابێ، جا تۆ ئەی مرۆڤی خواناس‌و ژیرکاتی خۆت بەفیڕۆ لەدەست مەدەو ئەم ژیانە کە کێڵگەی پاشەرۆژتە تۆیەکی چاکی تێدا بڕوێنە تا بەرهەمێکی چاك بەدەست بهێنی .

## (٣٩) سورەتی زومەر (٧٥)

سورەتی زومەر کە سورەتی سی‌و نۆهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتۆتە خوارەوەو حەفتاو پێنج ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی پەنجاو نۆهەمەو پاش سورەتی (سبأ) و پێش (غافر) دابەزیوە. دایکی باوەڕداران عایشە دەڵێت:{كَانَ النَّبِيُّ ﷺ لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الزُّمَرَ وَبَنِي إِسْرَائِيلَ /الترمذي، صححه الالباني/ پێغەمبەر نەدەخەوت تا سورەتی زومەرو بەنی ئیسرائیلی نەخوێندایە} وشەی (الزُّمَر) کە بە مانای کۆمەڵ، پێڕ ، تاقمە تەنها دوو جار لە قورئاندا ئەویش لە ئایەتی حەفتاویەك‌و حەفتاو سێی ئەم سورەتەدا هاتوە.

بەناوی اللهی زۆربەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١) دابەزینی ئەم قورئانە لەلایەن (الله)ی، بە دەسەڵات و داناوەیە.

(٢) بێگومان ئێمە ئەم پەراوەمان بۆ مەبەستێکی ڕاست ناردوەتە لات ، جا بە چاکی هەر بۆ زاتی الله بەندایەتی بکەو وهەر بۆ ڕێبازی ئەو خۆت یەکلا بکەرەوە.

(٣) ئاگاداربە ئایینی پاك هەر هی (الله)یەو ئەو زاتە تەنها کرداری پاك لە شیرك وەردەگرێت، جا ئەو کەسانەی کە جگە لە ئەو دەکەن بە دۆست بۆ خۆیان‌ودەڵێن: ئێمە بەندایەتی ئەمانە ناکەین مەگەر بۆئەوەی کە لە خواوە نزیکمان بکەنەوە واتە، موشریکان ئەو شیرکەی کە دەیکەن بەتاوان‌و شیرکی نازانن بەڵکو بە عیبادەت‌و نزیك بونەوە لە الله ناوی دەبەن کەواتە بت پەرستان باوەڕیان بە بون‌و دەسەڵاتی الله هەبوە بەڵام لە پەرستندا هاوەڵی بۆ دادەنێن بۆیە الله ڕقی لێیانەو لێیان خۆش نابێت مەگەر پەشیمان ببنەوە ، بێگومانالله لەبارەی ئەوەی کەتێیدا ناکۆکن لەناویاندا بڕیار دەدات، بێگومانیش کە الله ڕێنمایی کەسێ ناکات کە ئەو کەسە درۆزن‌و خوا نەناس بێت واتە: هاوەڵ دانەران بۆ خوا بە کافریش ناو دەبرێن ، چونکە ڕاستی دەشارنەوەو ناڕاستی دەڵێن.

(٤) ئەگەر الله ئارەزۆی لێ بێت کە منداڵی هەبێ بەڕاستی هەڵی دەبژارد لەوەی کە دروستیکردوە ئەوەی کە خۆی بیویستایە، ئەو پاك‌و بێ هاوەڵ‌و بێ هاوتایە، ئەو (الله)یە کە خاوەنی هەمو وەسفە جوانەکانەو خاڵیە لە هەمو وەسفێکی نارێك‌و نە گونجاوو پەست، یەکەو هاوسەرو باوك دایك‌و منداڵی نیەو بەهێزە بەسەر هەمو دروستکراوەکانیدا.

(٥) الله ئاسمانان‌و زەوی بۆ مەبەستێکی ڕاست دروستکردوە شەو دەپێچێت بەسەر ڕۆژداو ڕۆژیش دەپێچێت بەسەر شەوداو بەدوای یەکدا دەیانسوڕێنێتەوەو بەگوێرەی پێویستی مرۆڤ زیادو کەمیان لەسەر حیسابی یەکتر پێدەکات.

جا خۆرو مانگیشی گەردنکەچ کردوە بۆ خزمەتی مرۆڤ و هەمویان دێن‌و دەچن تا کۆتایی بە ژیانی ئەم بونەوەرە بێنن کە کاتێکی ناوبراوەو بە تێپەڕبونی ئەم شەوو ڕۆژە کۆتای بەم جیهانە دێت واتە: هەر چرکەیەك کە دەچێت لە تەمەنی ئەم جیهانە کەم دەبێتەوە، ئاگادار بن هەر ئەو زاتە دەسەڵاتدارە بەسەر تەواوی ئەم بونەوەرەداو چاو پۆشیکارە لە گوناهی

بەندەکانی هەر کاتێ بەراستی ڕوی تێبکەنو داوای لێبوردنی لێبکەن.

(٦) لە یەك كەس دروستیكردون، پاشان لەو كەسەش هاوسەری بۆ دروستكردوە و لە مەڕو مالاَتیش هەشت جووتی بۆ ناردن، بزنو مەڕو وشترو مانگاو نێرو مێ، لە سكی دایكتاندا دروستیكردون بە دروستكردن پاش دروستكردن، دڵۆپەیەك ئاو پاشان گۆشتپارە، پاشان ئێسقانو پاشان ئێسقانی بە گۆشت داپۆشراو ، ئینجا هاتنە دنیاوە بەم چەشنەی كە خۆمان بە چاوی خۆمان دەیبینین ئەمەش لە جیهانێكدایە كە خاوەنی سێ تاریكییە: تاریكی لەشو تاریكی ڕەحمو تاریكی منداڵدانو لەو جێگا تەنگو بێدەرەتانەدا پەروەردگار چۆن بەو سەرو چاوو دەمو لوتو گوێو ملو لاشەو لاقو پەنجەی دەستو پێ و سیماجوانە ڕازاندویەتیەوە، بەڵێ، ئەوە (اللّٰه)یە كە پەروەردگارتانە دەسەڵاتو فەرمان هەر بۆ ئەوەو جگە لەو كەسی تر شایستەی پەرستن نیە ئیتر بۆچی لەم ڕاستیە لادەدرێن؟!

(٧) ئەگەر ئەم هەمو چاكەی (اللّٰه)تان لەبەرچاو نیە سپڵەو خوانەناسن ئەوسا بەبێ شك كەاللّٰه بێنیازە لە ئێوەو كوفرو ناسوپاسی ئێوە هیچ شتێك لە دەسەڵاتو هێزی ئەو كەم ناكاتەوە بەڵام ئەو بەو بێ نمەكیو خوانەناسیەی ئێوەڕازی نیەو ڕقیەتی لەو سپڵەیی و بێ خواییەتان بەڵام ئەگەر سوپاسی بكەن ڕازی دەبێت لێتان، وە هیچ كەسێكی تاوانبار تاوانی كەسێكی تر هەڵناگرێت، هەركەس باری خۆی لە ملی خۆیەتی ، پاشانیش گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منە ، ئەوسا ئەوەی كە كردوتانە پێتان دەڵێم، بێگومان بزانن كە ئەو زانەری ئەوەیە كە لەناو دڵەكاندایەو هیچی لێ ون نابێت نە چاكو نەخراپ. لە فەرمودەدا هاتوە كە اللّٰهدەفەرموێ: (يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَيْئًا يَا عِبَادِي لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَفْجَرِ قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا /مسلم/ ئەی بەندەكانم بێگومان ئەگەر لەسەرەتاوە تا كۆتاییتان بە مرۆڤو جنۆكەوە هەموتان وەك پەرهیزكارترین دڵی پیاوێكتان بێ هیچ شتێك لەموڵكی من زیاد ناكات ، ئەی بەندەكانم بێگومان ئەگەر لەسەرەتاوە تا كۆتاییتان بە مرۆڤو جنۆكەوە هەموتان وەك خراپترین دڵی كەسێك لە ئێوە بێت ئەوە هیچ شتێك لە موڵكی من كەم ناكاتەوە}. ئینجا پەروەردگار باسی بێ وەفایی مرۆڤ دەكاتو دەفەرموێ:

(٨) مرۆڤ هەركاتێك دوچاری زیانێك ببێت حاڵی وایە دەگەڕێتەوە لای پەروەردگاریو دەپاڕێتەوە لێی بۆ ئەوەی كە ئەو

خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ ثُمَّ جَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَأَنزَلَ لَكُم مِّنَ الْأَنْعَامِ ثَمَانِيَةَ أَزْوَاجٍ ۚ يَخْلُقُكُمْ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ خَلْقًا مِّن بَعْدِ خَلْقٍ فِي ظُلُمَاتٍ ثَلَاثٍ ۚ ذَٰلِكُمُ اللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ الْمُلْكُ ۖ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ فَأَنَّىٰ تُصْرَفُونَ (٦) إِن تَكْفُرُوا فَإِنَّ اللَّهَ غَنِيٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ الْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا يَرْضَهُ لَكُمْ ۗ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُم مَّرْجِعُكُمْ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ۚ إِنَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ (٧) ۞ وَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَا رَبَّهُ مُنِيبًا إِلَيْهِ ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُ نِعْمَةً مِّنْهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدْعُو إِلَيْهِ مِن قَبْلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادًا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِ ۚ قُلْ تَمَتَّعْ بِكُفْرِكَ قَلِيلًا ۖ إِنَّكَ مِنْ أَصْحَابِ النَّارِ (٨) أَمَّنْ هُوَ قَانِتٌ آنَاءَ اللَّيْلِ سَاجِدًا وَقَائِمًا يَحْذَرُ الْآخِرَةَ وَيَرْجُو رَحْمَةَ رَبِّهِ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُو الْأَلْبَابِ (٩) قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ ۚ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۗ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ ۗ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُم بِغَيْرِ حِسَابٍ (١٠)

بارەی لەسەر لابەرێت پاشان هەر كاتێ چاكەی لەگەڵدا بكات زوو خۆی لێ دەگۆڕێو كوردواتەنی "دەڵێیت نەبای دیوەو نەباران"و لەبیری دەچێتەوە كە لەپێشدا لێی پاڕاوەتەوە تا ئەو بارەی لەسەر لابردوەكەچی ئەو هاوەڵ بۆ اللّٰه دادەنێت تا بەو شێوەیە خەڵكیش لە ڕێگای اللّٰه لابدات، ئەی محمدﷺ بەو كەسە بڵێ: بەو سپڵەییو بێباوەڕیتەوە كەمێك ڕابوێرە ، دڵنیابە كە تۆ لە یارانی ئاگریت، بەڵێ ئەوەیە سەر ئەنجامی سپڵەییو بێدینی، بەڵام پیاوانی چاكو بەندەیانی ڕاستەقینەی اللّٰه هەم كاریان جیایەو هەم پاداشتیش ، وەك دەفەرموێ:

(٩) ئایا ئەو كەسەی كە لە كاتەكانی شەودا مل كەچنو لە كاتی سوجدەو وەستاندان و دەترسن لە ڕۆژی دواییو هیوای بەزەیی پەروەردگارشیان هەیە وەك ئەو كەسە وایە كە سپڵەو نمەك نەناسو بێباوەڕەو لەبیری گیرفان پڕدنو سك پڕكردندایە؟ بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن وەكو ئەوانەن كە نازانن؟ بێگومان هەر ئەوەی كە خاوەنی ژیریە بیر دەكاتەوەو بەهرەمەند دەبێت، كەسانی تر مەگەر بمرن ئەوسا بیر بكەنەوە مەخابن لەو بیركردنەوەیەش.

(١٠) ئەی محمدﷺ بڵێ : پەروەردگارم بەندەكانی بانگ دەكاتو دەفەرموێ: ئەی ئەو بەندانەم كە باوەڕتان هێناوە لە پەروەردگاری خۆتان بترسن، بۆ ئەو كەسانەی كە لەم دنیادا چاكەیان كردوە لە ڕۆژی دواییدا چاكەیان بۆ هەیە كە بەهەشتە،

قُلْ إِنِّيٓ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ مُخْلِصًا لَّهُ ٱلدِّينَ ﴿١١﴾ وَأُمِرْتُ لِأَنْ أَكُونَ أَوَّلَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿١٢﴾ قُلْ إِنِّيٓ أَخَافُ إِنْ عَصَيْتُ رَبِّي عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣﴾ قُلِ ٱللَّهَ أَعْبُدُ مُخْلِصًا لَّهُۥ دِينِي ﴿١٤﴾ فَٱعْبُدُوا۟ مَا شِئْتُم مِّن دُونِهِۦ ۗ قُلْ إِنَّ ٱلْخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَأَهْلِيهِمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْخُسْرَانُ ٱلْمُبِينُ ﴿١٥﴾ لَهُم مِّن فَوْقِهِمْ ظُلَلٌ مِّنَ ٱلنَّارِ وَمِن تَحْتِهِمْ ظُلَلٌ ۚ ذَٰلِكَ يُخَوِّفُ ٱللَّهُ بِهِۦ عِبَادَهُۥ ۚ يَٰعِبَادِ فَٱتَّقُونِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱجْتَنَبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ أَن يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ لَهُمُ ٱلْبُشْرَىٰ ۚ فَبَشِّرْ عِبَادِ ﴿١٧﴾ ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٨﴾ أَفَمَنْ حَقَّ عَلَيْهِ كَلِمَةُ ٱلْعَذَابِ أَفَأَنتَ تُنقِذُ مَن فِي ٱلنَّارِ ﴿١٩﴾ لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِّن فَوْقِهَا غُرَفٌ مَّبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ وَعْدَ ٱللَّهِ ۖ لَا يُخْلِفُ ٱللَّهُ ٱلْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِي ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُۥ حُطَٰمًا ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢١﴾

جا لەدنیادا خۆتان زەبونی بەردەستی خوا نەناسان مەکەن زەویەکەی ﷲ فرەوانەو کۆچ بکەن بۆ ئەو جێگایەی کە دەتوانن بە ئازادی بەندایەتی (ﷲ)ی تێدابکەن‌و خۆتان ڕاگرن لەسەر ئێش‌و ئازارێك کە لەسەر خواپەرستی دوچاری دەبن چونکە خۆگران هەر پاداشتێکی بێ ژمارە وەردەگرن.

﴿١١﴾ ئەی محمدﷺ بڵێ: بێگومان من فەرمانم پێکراوە کە بەندایەتی ﷲ بکەم‌و ئایینم خاوێن بکەمەوە بۆی.

﴿١٢﴾ جا فەرمانم پێکراوە تا من یەکەم کەسی ئەم گەلە بم بۆ ملکەچی فەرمانی پەروردگارم.

﴿١٣﴾ بڵێ: بێگومان ئەگەر من سەرپێچی فەرمانی پەروەردگار بکەم دەترسم لە سزای ڕۆژێکی گەورە.

﴿١٤﴾ بڵێ: هەر ﷲ دەپەرستم کە بۆ ئەو ئاینم پاك دەکەمەوەو جگە لەوی تێکەڵ ناکەم.

﴿١٥﴾ ئەوسا ئیتر ئێوە جگە لەﷲ هەرچیتان ئەوێت بیپەرستن. ئەمە هەڕەشەیە نە سەربەخۆی لە پەرستندا. بڵێ: بێگومان ڕەنجەڕۆ ئەو کەسانەن کە خۆیان‌و کەس‌و کاریان لە ڕۆژی قیامەتدا دۆڕاندوە، بزانە بەڕاستی هەر ئەمەیە ڕەنجەڕۆبونی ئاشکرا.

﴿١٦﴾ لە ڕۆژی قیامەتدا سێبەری سەریان و پێخەخەی ژێریان ئاگرە. ئەمە ئەوەیە کە ﷲ بەندەکانی پێدەترسێنێ تا دەست لە خوا نەناسی‌و خراپەو تاوان بکێشنەوە، جا بۆیە دەفەرموی: ئەی بەندەکانم لەمن بترسن.

﴿١٧﴾ جا ئەو کەسانەی کە لە پەرستنی سەرکەش‌و یاخی بوان دوور دەکەونەوەو دەگەڕێنەوە بۆ لای ﷲ مزگێنی هەر بۆ ئەوانە ، سا تۆ موژدە بدە بەو بەندانەم.

﴿١٨﴾ ئەوکەسانەی کە گوێ لەهەمو قسەیەك دەگرن ئەوسا لەوەیان کە چاکترە پەیڕەوی دەکەن کە قورئان‌و فەرمودە بەنرخەکانی پێغەمبەرمانەﷺ ئەمانە ئەو کەسانەن کە ﷲ ڕێنمایی کردون، ئا ئەوانەن کە خۆیان خاوەنی ژیریی‌و شارەزایی‌و تێگەیشتنیان ڕاست‌و ڕەوانە.

﴿١٩﴾ ئایا ئەوانەی کە باسکران‌و ئەو کەسەی کە بڕیاری سزا بەسەریدا چەسپیوە وەکو یەکن؟ ئەی ئایا تۆ دەتوانیت کەسێ کە لە ناو ئاگردا بێت ڕزگاری بکەیت؟ نەخێر.

﴿٢٠﴾ بەڵام ئەو کەسانەی کە لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن‌و دژایەتی ناکەن ، بەڵکو فەرمانەکانی بەچاکی جێ بەجێ دەکەن بۆ ئەوان هۆدە گەلێك هەیە کە لەسەریانەو هۆدەگەلی تر دروستکراوەو لەژێریانەوە چەندین ڕووبار فڕکەی دێت. ئەمە بەڵێنی (ﷲ)یە کە داوێتی بەو پارێزکارانە. کە (ﷲ)یش پێچەوانەی بەڵێنی خۆی ناکات‌و ئەم بەخششە جوان‌و بە نرخانەیان پێدەدات.

﴿٢١﴾ ئەی بینەر مەگەر تۆ نەتبینی کە ﷲ لە ئاسمانەوە ئاوی دابەزاند ئەوسا لەناو زەویدا کردی بە چاوگەی گەورەو بچوك بەگوێرەی پێویستی خەڵك‌و پاشان بەو ئاوە باخ‌و بێستان‌و کشتوکاڵی ڕەنگاو ڕەنگی سەوز کرد ، پاشان پێیگەیاند ئەوسا تۆ دەبینی زەردەو پاشان دەیکات بە پل‌و پوش ، بەڕاستی ئا لەمەدا ئامۆژگاری‌و پەند هەیە بۆ خاوەن عەقڵان، ئینجا پەروەردگار پاش ئەوەی کە پەڕاوی بونەوەری بەکورتی خستە پێش چاومان، پێناسەی ئەم ئایین‌و پەڕاوە بەنرخەمان بۆ دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٢٢﴾ ئایا ئەو کەسەی کە ﷲ دڵی فرەوان کردوە بۆ ئیسلام ، جا ئەو لەلایەن پەروەردگاریەوە لەسەر ڕوناکی بێت وەك ئەو کەسە وایە کە سەر لێشێواو گۆمرا بێت؟ وای بۆ ئەو کەسانەی کە دڵیان ڕەقە لە یادی ﷲ ئەوانە لە گومرایی ئاشکرادان.

﴿٢٣﴾ زاتی ﷲ جوانترین قسەی ناردوە کە پەڕاوێکەو سورەتەکانی لەیەك دەچن‌و دووبارە کراوەیەو بە خوێندنەوەی

پێستی لەشی ئەو کەسانەی کە لە پەروەردگاریان دەترسن موچرکەی پێدا دێت ، پاشان پێستیان و دڵیان نەرم دەبێت بۆ یادی ﷲ، ئەمەیە ڕێنمای ﷲ بۆ هەر کەسێك کە ئارەزۆی لێ بێت ڕێنمایی دەکاتو هەرکەسێکیش کە ﷲ ڕێگای لێ ون بکات ئیتر هیچ کەسێکی تری نیە کە ڕینمایی بکات. قەتادە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی خوێندەوەو وتی: ئەمە وەسفی دۆستەکانی (ﷲ)یە. ﷲ وەسفیان دەکات کە ئەمانە بە خوێندنەوەی قورئان موچرکە دەهات بە لەشیانداو چاویان دەگریاو دڵیان ئارام دەبو ، خۆ وەسفیان ناکات بەوەی کە هۆشیان نەدەماو لەخۆ دەچوون بەڵکو ئەم جۆرە ڕەفتارو بۆچونە هەر لەناو خەڵکی بیدعەچی دایە.جا بێگومان ئەمە لە شەیتانەوەیە و خەڵك بەرەو ڕیایی دەباتو کردارە چاکەکانیان هەڵدەوەشێنێتەوە .

(٢٤) ئایا ئەو کەسەی کە لە ناو نازو نیعمەت و سێبەری چڕوپڕو کانیاوو ژیانی خۆش دایە ، وەك ئەو کەسەیە کە لە ناو ئاگردایەو دەیەوێت بە دەم وجاوی، خۆی لە سزای ڕۆژی قیامەت بپارێزێتو ناچاوانی کردوە بە سپێر بۆ پاراستنی خۆی لەئاگر؟ جا بەو ستەمکارانە دەوترێت سزای ئەو کارە ناپەسەندانەی کە کردوتانە بچەژن.

(٢٥) ئەوانەی پێش ئەمانەیش پێغمبەرانایان بە درۆ خستەوە جا بەهۆی ئەو تاوانەوە سزایان بۆ هات لە جێگایەکەوە کە هەستیان پێ نەکرد تا دای بەسەریاندا.

(٢٦) جا ﷲ هەر لە دنیادا تاڵاوی سەرشۆڕی پێ چەژاندن بەڕاستی ئەگەر بزانن سزای ڕۆژی دوای گەورەترەلەم سزای دنیایە.

(٢٧) سا بەراستی ئێمە بۆ خەڵکی لەم قورئانەدا لە هەمو نمونەیەك کە پێویست بێت هێناومانە بەڵکو بیر بکەنەوە.

(٢٨) کە ئەمە قورئانێکی عەرەبیەو هیچ ناتەوایەکی تێدا نیە ، بەڵکو ئەوان بیر لە دەسەڵاتی ﷲ بکەنەوەو لێی بترسنو پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن.

(٢٩) ﷲ نمونەیەکتان بۆ باس دەکات: پیاوێك کە چەند کەسی دژ بە یەك سەرپەرشتی بنو هەر کام بۆ خۆی بڕیارێکی بە سەردا بدات و ئەویش نەزانێت بە گوێی کامیان بکات و کامیان لە خۆی رازی بکات. وە پیاوێکیش تایبەت

أَفَمَن شَرَحَ ٱللَّهُ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٖ مِّن رَّبِّهِۦۚ فَوَيۡلٞ لِّلۡقَٰسِيَةِ قُلُوبُهُم مِّن ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ﴿٢٢﴾ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ﴿٢٣﴾ أَفَمَن يَتَّقِي بِوَجۡهِهِۦ سُوٓءَ ٱلۡعَذَابِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَقِيلَ لِلظَّٰلِمِينَ ذُوقُواْ مَا كُنتُمۡ تَكۡسِبُونَ ﴿٢٤﴾ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ فَأَتَىٰهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٢٥﴾ فَأَذَاقَهُمُ ٱللَّهُ ٱلۡخِزۡيَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَكۡبَرُۚ لَوۡ كَانُواْ يَعۡلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدۡ ضَرَبۡنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ مِن كُلِّ مَثَلٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٢٧﴾ قُرۡءَانًا عَرَبِيًّا غَيۡرَ ذِي عِوَجٖ لَّعَلَّهُمۡ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾ ضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلٗا رَّجُلٗا فِيهِ شُرَكَآءُ مُتَشَٰكِسُونَ وَرَجُلٗا سَلَمٗا لِّرَجُلٍ هَلۡ يَسۡتَوِيَانِ مَثَلًاۚ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِۚ بَلۡ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٩﴾ إِنَّكَ مَيِّتٞ وَإِنَّهُم مَّيِّتُونَ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ إِنَّكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عِندَ رَبِّكُمۡ تَخۡتَصِمُونَ ﴿٣١﴾

لەژێر فەرمانی یەك پیاودا بێت و یەك جۆر فەرمانی بەسەردابدات ئایا بارو حاڵی ئەم دوو وێنە وەکو یەکە؟

**مرۆڤی یەکەم** نمونەی ئەوانەن کە بێجگا لە ﷲ - یان مەبەستەو هەر جار لەژێر فەرمان وبەرژەوندی لایەکدان و بۆ رازی کردنیان هەمو هەوڵێك دەدن سەرەنجام هەندێکیانی لێدەرەنجێ.

وە **مرۆڤی دووهەم** نمونەی ئەهلی تەوحیدە کە جگە لە ﷲ مەبەستی تریان نیەو رازی کردنی (ﷲ)یش زۆر ئاسانە. جا سوپاس هەر بۆ (ﷲ)یە چونکە هەر ئەوە تواناو داناو خاوەن بەخششو نیعمەتە بەڵام زۆربەیان ئەم ڕاستیە نازانن.

(٣٠) بێگومان تۆ دەمریت، چونکە هاتن بۆ دنیا تەنها بۆ تاقی کردنەوەیەو زۆر بە پەلە دوایی دێت، خۆ ئەوانیش هەر دەمرن.

(٣١) پاشان بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای پەروەردگارتان کێشەتان دەبێت و لەبەر سەختی سزای ئەو ڕۆژە هەر کەس ئەویتر تاوانبار دەکات، وە بڕیاری ڕاست لەسەر هەموتان لەوێدا دەدریت ، ئەوسا ڕاستان بەهەشتین وناحەقانیش بەرەو دۆزەخ بەڕێ دەکرێن.

۞ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن كَذَبَ عَلَى ٱللَّهِ وَكَذَّبَ بِٱلصِّدْقِ إِذْ جَآءَهُۥٓ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَـٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّذِى جَآءَ بِٱلصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ ۙ أُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمْ ۚ ذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ ٱلَّذِى كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِكَافٍ عَبْدَهُۥ ۖ وَيُخَوِّفُونَكَ بِٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٦﴾ وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّضِلٍّ ۗ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِعَزِيزٍ ذِى ٱنتِقَامٍ ﴿٣٧﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۚ قُلْ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ إِنْ أَرَادَنِىَ ٱللَّهُ بِضُرٍّ هَلْ هُنَّ كَـٰشِفَـٰتُ ضُرِّهِۦٓ أَوْ أَرَادَنِى بِرَحْمَةٍ هَلْ هُنَّ مُمْسِكَـٰتُ رَحْمَتِهِۦ ۚ قُلْ حَسْبِىَ ٱللَّهُ ۖ عَلَيْهِ يَتَوَكَّلُ ٱلْمُتَوَكِّلُونَ ﴿٣٨﴾ قُلْ يَـٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَـٰمِلٌ ۖ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٤٠﴾

﴿٣٢﴾ جا کێ ستەمکارترە لەو کەسەی کە درۆ بەدەم ﷲ - وە بکاتو بڵێ: ﷲ هاوەڵ یان هاوسەر یان منداڵی هەیە، وە بێباوەڕ بو بێت بەم ڕاستیە کە قورئانە کاتێك کە هاتووەتە لای و بیستویەتی، ئایا دۆزەخ جێگای خوانەناسان نیە؟ دەی بۆ بە باوەڕ هێنان بەم قورئانە خۆیان لەو دۆزەخە ناپارێزن؟

﴿٣٣﴾ جا ئەو کەسەی کە ئەم قورئانەی هێناوە کە محمدەﷺ ، وە ئەو کەسەی کە باوەڕی پێکردوە هەر ئەوانن پارێزکار، کە سەر قافڵەی باوەڕداران ئەبوبەکری سدیقە(خوالێی ڕازی بێ).

﴿٣٤﴾ لەلای پەروەردگاری خۆیان ئەوەی کە بیانەوێت بۆیان هەیە، ئا ئەوەیە پاداشتی چاکەکاران.

﴿٣٥﴾ تا لە عاقیبەت دا ﷲ لە خراپترین کارێك کە کردویانە چاوپۆشی بکاتو پاداشتیان بە چاکتریش لەوەی کە کردویانە بداتەوە.

﴿٣٦﴾ ئایا ﷲ بەس نیە بۆ بە هانا هاتنو یارمەتیدانی بەندەکانی؟ کەچی ئەوان تۆ دەترسێنن بە کەسانی تری جگە لەو زاتە! خۆ هەرکەسێك کە خوا سەری لێتێکبدا کەسێکی تر نیە ڕێنمایی بکات.

﴿٣٧﴾ خۆ هەر کەسێکیش کەﷲ ڕینمایی بکات هیچ گومراکەرێك ناتوانێت کە سەری لێتێکبداتو گومڕاهی بکات. ئایا ﷲ بەدەسەڵاتو تۆڵەسێن نیە؟ جا کەواتە کەسی لە دەست دەر ناچێتو تۆڵە لە هەمو ستەمکارێك وەردەگرێت.

﴿٣٨﴾ جا ئەگەر پرسیاریان لێبکەیت کێ ئاسمانانو زەوی دروستکردوە بەدڵنیایەوە دەڵێن:ﷲ ، پێیان بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ﷲ ویستی زیانێکم لێبدات ئایا ئەوانەی کە جگە لە ﷲ دەیانپەرستن دەتوانن ئەو زیانە لابەرن؟ یان ئەگەر ویستی بەزەیی پێمدا بێتەوە ئایا ئەوانە دەتوانن بەرگری لەو بەزەییە بکەن؟ بڵێ: ﷲ بەسە بۆم، جا ئەوانەی کەدەیانەوێت پشتی خۆیان جێگرو پتەو بکەن با هەر بەو پشت ببەستن.

﴿٣٩﴾ بڵێ: ئەی گەلی من چۆن بۆتان دەکرێت ئیشی خۆتان بکەنو منیش چۆنم بۆ ئەلوێت ئیش دەکەم جا بەم زوانە دەزانن چیتان کردوە.

﴿٤٠﴾ هەر کەسێك سزای بۆ بێت ئەوا سەرشۆڕی دەکاتو ئەو سزایە لە سەری هەمیشەیی دەبێت.

﴿٤١﴾ بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان بەڕاستیو بۆ مەبەستێکی ڕەوا ناردە لات، ئەوسا هەر کەسێك کە ڕێنمایی وەرگرێت خۆی سودمەندەو هەر کەسێکیش کە گومڕا ببێت ئەوە هەر بەخۆی زیانی گەیاندوەو تۆ زامنی ئەوان نیت. ئەمەش دڵدانەوەیەکە بۆ پێغەمبەرمانﷺ تا بەو دژایەتیەی موشریکان زۆر خەمبارو دڵتەنگ نەبێ. ئینجا پەروەردگار تێمان دەگەیەنێت کە تەنها خۆیەتی ئاڵوگۆڕ لەم بونەوەرەدا دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٤٢﴾ (ﷲ)یە کە گیانەکان وەردەگرێت لەکاتی مردنیدا ، هەروەها ئەو گیانەش کە هێشتا کاتی مردنی نەهاتوە لەکاتی خەوتندا وەری دەگرێت ، جا ئەو گیانەی کە بڕیاری مردنی دراوە لەلای خۆی وەری دەگرێتو نایگەڕێنێتەوە بۆ لەشیو دەیمرێنێت. ئەویتریان بەڕەڵا دەکاتەوە کە دێتەوە لەشی هەتا کاتی دیاری کراوی دێت. بێگومان ئا لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ ئەو گەلەی کە ورد دەبنەوەوتێ ئەفکرێن.

ئەبو هورەیرە دەڵێت پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی:{ إِذَا أَوَى أَحَدُكُمْ إِلَى فِرَاشِهِ فَلْيَنْفُضْ فِرَاشَهُ بِدَاخِلَةِ إِزَارِهِ فَإِنَّهُ لَا يَدْرِي مَا خَلَفَهُ عَلَيْهِ ثُمَّ يَقُولُ بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ /البخاری/ واتە: هەر کاتێك یەکێك لە ئێوە چوو بۆ سەر جێگای خەوتنی با بە دامێنی خۆی ئەو جێگایە بتەکێنێ ، چونکە نازانێ پاش خۆی چی هاتوەتە جێگاکەی پاشان با بڵێت: ئەی پەروەردگارم بەناوی تۆوە شانم دادەدەم، هەر بەناوی تۆیشەوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر گیانم وەردەگریت دەی ڕەحمی پێ بکەو ئەگەر بەڕەڵایشی دەکەیت سا بیپارێزە بەو شێوەیەی کە بەندە چاکەکانت دەپارێزیت}

ئینجا پەروەردگار لۆمەی بت پەرستو هاوەڵ دانەران دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٣) ئایا بێجگە لە ﷲ شتانی تر دەکەن بە تکاکار بۆ خۆتان، پێیان بڵێ: ئایا ئاوا نەزانانە ڕەفتار دەکەنو ئەو بتانە بەشت دەزانن ئەگەر چی ئەوانە خاوەنی هیچ شتێك نینو هیچیش نافامن؟

(٤٤) بڵێ: تکاکاریو شەفاعەت هەر هەموی تەنها بەدەست (ﷲ)یە کە ئاسمانانو زەویش مۆڵکیتی، پاشان هەر بۆ لای ئەو خۆیشی دەبرێنەوە.

(٤٥) جا هەرکاتێك یادی ﷲ بە تەنهایی بکرێو هاوار بۆ کەسی تر نەبرێت دڵی ئەو کەسانەی کە بە ڕۆژی دوایی باوەڕ ناهێنن دەشێوێتو کۆڕەکەیان بەلاوە ساردەو کەم بایەخە! بەڵام هەر کاتێك یادی کەسانی تری جگە لەو بکرێت کتوپڕ شادو کەیفخۆش دەبنو بەیەکتر مژدە دەدەن. بەداخەوە ئەمڕۆ هەرکەسو گرۆو تاقمو پێڕێك ئەوەندەی بە باسی گەورەو شێخو سەرۆك حیزبەکەیان شادمانو کەیفخۆشن ئەوەندە بە باسی تاكو تەنیای ﷲ کەیفخۆشنین، وە ئەوەندە بەرگری لەوان دەکەن ئەوندە بەرگری لە خواو پێغەمبەرەکەی ناکەن لەهەر کامیش بپرسیت دەڵێ: خواناسو موسڵمانم. خۆ ئەم ئایەتە هەردووتای تەرازووەکەی دیارە ، جا بۆ خۆت تەماشای بکەو بزانە تۆ لەکامیانیو خۆت مەخەڵەتێنە، مردیت گەڕانەوەت نیە بۆ ئیشکردنو پەشیمانی ئەوکاتەش بێسوودە .

إِنَّآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ لِلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّۖ فَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ فَلِنَفۡسِهِۦۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيۡهَاۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا وَٱلَّتِي لَمۡ تَمُتۡ فِي مَنَامِهَاۖ فَيُمۡسِكُ ٱلَّتِي قَضَىٰ عَلَيۡهَا ٱلۡمَوۡتَ وَيُرۡسِلُ ٱلۡأُخۡرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ شُفَعَآءَۚ قُلۡ أَوَلَوۡ كَانُواْ لَا يَمۡلِكُونَ شَيۡـٔٗا وَلَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤٣﴾ قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعٗاۖ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ﴿٤٤﴾ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحۡدَهُ ٱشۡمَأَزَّتۡ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٤٥﴾ قُلِ ٱللَّهُمَّ فَاطِرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ عَٰلِمَ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ أَنتَ تَحۡكُمُ بَيۡنَ عِبَادِكَ فِي مَا كَانُواْ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَ ﴿٤٦﴾ وَلَوۡ أَنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ مَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفۡتَدَوۡاْ بِهِۦ مِن سُوٓءِ ٱلۡعَذَابِ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَبَدَا لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مَا لَمۡ يَكُونُواْ يَحۡتَسِبُونَ ﴿٤٧﴾

(٤٦) بڵێ: پەروەردگارم، ئەی دروستکەری ئاسمانانو زەویو زانەری شاراوەو ئاشکراکان هەر خۆتی کە لەڕۆژی دواییدا لەنێوان بەندەکانتا لەو شتەی کە ناڕێکن تێیدا بڕیار دەدەیت.

(٤٧) بەڕاستی ئەگەر ئەوەی لەناوی زەویدایە هەمویو ئەوەندەی تریشی لەسەر بێت مۆڵکی ئەو کەسانە بێت کە ستەمیان کردوە ئامادەن لە جیاتی سزای خراپی ڕۆژی قیامەتدا بیدەن. دیارە ئەوەیان نیەو ئەگەر ئەوەیشیان ببوایە لێیان وەرنەدەگیراو ستەمکاران هەر دەبێ ئەو سزایە بچەژن، جا بیربکەنەوە پێش ئەوەی بەو ڕۆژە بگەن. بەڵێ ، لەو ڕۆژەدا ئەوەی کە هیچ حیسابیان بۆ نەدەکردو نەهاتوە بە خەیاڵیاندا هەموی لەلایﷲ ئاشکرا دەبێت.

(٤٨) جا لەو ڕۆژەدا خراپی ئەو کردارانەی کە کردویانە بۆیان دەرکەوتو دای بەسەریاندا سزای ئەوەی کە گاڵتەیان پێ دەکرد.

(٤٩) ئەوسا ئەو مرۆڤەی کە باسی تەوحیدی (ﷲ)ی بۆ دەکرا دڵی بەیەکدا دەهات ، هەر کاتێك هەستی بە زیانێك بکردایە هاواری بۆ دەهێنایی پاشان هەر کاتێك لەلایەن

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٤٨﴾ فَإِذَا مَسَّ الْإِنسَانَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَاهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَىٰ عِلْمٍ ۚ بَلْ هِيَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا ۚ وَالَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْ هَٰؤُلَاءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّئَاتُ مَا كَسَبُوا وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَبْسُطُ الرِّزْقَ لِمَن يَشَاءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٢﴾ ۞ قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ ۚ إِنَّ اللَّهَ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوا إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَاتَّبِعُوا أَحْسَنَ مَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴿٥٥﴾ أَن تَقُولَ نَفْسٌ يَا حَسْرَتَىٰ عَلَىٰ مَا فَرَّطتُ فِي جَنبِ اللَّهِ وَإِن كُنتُ لَمِنَ السَّاخِرِينَ ﴿٥٦﴾

خۆمانەوە منەتمان بخستایە سەری‌و بکەوتایە خۆشیەوە دەیوت: ئەم خۆشی‌و نیعمەتە بۆیە پێمدراوە چونکە باش زانراوە کە من شایستەی ئەمەم ، نەخێر وانیە ئەمە پیاو چاکی تۆ ناگەیەنێت بەڵکو تاقیکردنەوەیەکە تا دەرکەوێت ئایا سوپاسی ﷲ دەکرێت یان کوفرو سپڵەی‌و بێنمەکی لەگەڵدا دەکرێت بەڵام زۆربەیان ئەم راستیە نازانن.

﴿٥٠﴾ بەراستی کەسانی تر پێش ئەوانیش ئەم قسەیان کردوە بەڵام ئەوەی کە کرد بویان‌و ئەوەش کە کۆیان کرد بویەوە سودی بەئەوان نەگەیاند.

﴿٥١﴾ ئینجا دوچاری سزای ئەو خراپانە بون کە کردبویان، لەناو ئەمانەی ئومەتی تۆدا ئەو کەسانەی کە ستەمیان کردبو بەم زوانە دوچاری سزای ئەو ئیشە خراپانە دەبن کە کردویانەو ناشتوانن رێگا لەو سزایە بگرن.

﴿٥٢﴾ ئایا دەوڵەمەندی بە نیشانەی خۆش بەختی‌و هەژاری بە نیشانەی بەد بەختی دەزانن‌و نازانن کە بەڕاستی (ﷲ)یە کە رۆزی فرەوان دەکات بۆ هەر کەسێك کە ئارەزوی لێبێت‌و دەیگرێتەوە لە هەر کەسێکیش کە ئارەزوی لێبێت‌و هیچکەس‌و هیچشت نابێ بە بەرپەرچ لە رێگای ویستی (ﷲ)دا، دەوڵەمەندی‌و هەژاری تەنها بۆ تاقیکردنەوەیەو بەدەست (ﷲ)یە، بە بێگومان لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە باوەڕ دەهێنێت، ئینجا پەروەردگاری میهرەبان دەرگای میهرەبانی خۆی دەکاتەوەو گرنگترین موژدە بە مرۆڤ بەتایبەت تاوانباران دەدات‌و دەفەرموێ:

﴿٥٣﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ: پەروەردگاری میهرەبان بانگتان دەکات‌و دەفەرموێ: ئەی ئەو بەندانەی کە بە کوفرو تاوان‌و خراپەکاری زیادەڕەویتان کردوە لەسەر نەفسی خۆتان نائومێد مەبن لە سۆزی ﷲ، بێگومان کەﷲ لە تەواوی گوناهانتان خۆشدەبێت ئەگەر لە هاوبەش دانان بۆﷲ پەشیمان ببنەوە، بێگومان ئەو هەر خۆیەتی لێبوردەو بەسۆزە بۆ بەندەکانی.

ئای چەند بانگەوازێکی خۆشە وای چەند بەدبەختە ئەو کەسەی کە بە دەم ئەم بانگەوازییەوە نەڕوات، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ لَوْلَا أَنَّكُمْ تُذْنِبُونَ لَخَلَقَ اللَّهُ خَلْقًا يُذْنِبُونَ يَغْفِرُ لَهُمْ /مسلم وغيره/ ئەگەر ئێوە گوناهتان نەکردایە ﷲ دروستکراوێکی تری دروستدەکرد کە گوناح بکەن جا لێیان خۆش ببێ}

دیارە مەبەست ئەوەیە کە مرۆڤ هەر توشی تاوان دەبێت، جا گرنگ ئەوەیە لەسۆزی پەروەردگاری نائومێد نەبێت‌و بەباشی بگەڕێتەوە بۆ لای ﷲ .

﴿٥٤﴾ سا بگەڕێنەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆتان‌و خۆتان بەو بسپێرن پێش ئەوەی سزاتان بۆ بێت، پاشان کەس بە دەمتانەوە نەیەت.

﴿٥٥﴾ جا دوای جوانترینی ئەوانە بکەون کە لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان رەوانە کراوە کە قورئانە پێش ئەوەی بە کتو پڕی سزاتان بۆ بێت‌و ئێوە هەستی پێ نەکەن.

﴿٥٦﴾ ئەوسا ئەو کەسە بڵێ وای بۆ من لەسەر ئەو کۆتایی‌و کەمکاریەم کە لە بەرامبەر فەرمانی(ﷲ)دا کردم و بێگومان من لەو کەسانەش بوم کە گاڵتەیان بەم قورئان‌و پەیامبەر دەکرد.

﴿٥٧﴾ جا یان بڵێت ئەگەر ﷲ رێنمایی بکردمایە بەڕاستی لە پارێزکاران دەبوم.

واتە ئەوانەی کە لەدنیادا زمانیان درێژ دەکەنودەڵێن ئێمە ئازادینو نابێ پەتی ئایین لەملماندابێ لەوێ دەڵێن ئێمە بێ دەسەڵاتبووبین؟!

(٥٨) یان کاتێك کە سزا دەبینی دەڵێیت ئەگەر جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ دنیا ئەوسا لە پیاو چاکان دەبم. بەراستی پەروەردگار چاك بەندەی خۆی دەناسێت بۆیە لەوەڵامی ئەوانەدا دەفەرموێ: ﴿ئەگر جارێکی تر بگەڕێنرێنەوە بۆ دنیا دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو کارە خراپانەی کە بەرگری کراوە لێیان﴾ئەنعام/٢٨. لێرەش دەفەرموێ:

(٥٩) وانیەو تۆیش ڕاست ناکەیت بەراستی نیشانەکانی من هاتە لات جا تۆ باوەڕت پێ نەکردو لە خوا نەناسان بویت.

(٦٠) جا لە ڕۆژی قیامەتدا ئەوانەی کە درۆیان بەدەم (ﷲ)وە کردوە ڕوویان ڕەشە، ئایا جێگای لوت بەرزان لەدۆزەخدا نیە؟

(٦١) خۆ ﷲ ئەو کەسانەی کە لێیترساون بەهۆی ئەو خۆشبەختیەوە کە بەهۆی پارێزکاری خۆیانەوە پێیان دراوە لە تەنگو چەڵەمەو سزای قیامەت ڕزگاریان دەکاتو توشی هیچ ناخۆشیو خراپەیەك نابنو ئەوان ئیتر غەمگین نابن.

(٦٢) ﷲ بەدیهێنەری هەمو شتێکەو هەر زاتی ئەوە کە چاودێرە بەسەر هەمو شتێکدا.

(٦٣) کلیلی ئاسمانانو زەوی هەربە دەست ئەوەو ئەو کەسانەی کە بە نیشانەکانی ﷲ بێباوەڕن ئەوە هەر ئەوانن ڕەنجەڕۆ.

(٦٤) پێیان بڵێ: ئایا پاش ڕون بونەوەی ئەو هەمو ڕاستیانە ئێوە پێم یەژن کە من جگە لە ﷲ بپەرستم ئەی نەزانان؟

(٦٥) ئەوسا بەراستی وەحی کراوە لای تۆ ئەی محمد ﷺ و لای ئەو پێغەمبەرانەیش کە لەپێش تۆدا بون کە: ئەگەر هاوبەش بۆ ﷲ بگریت دڵنیا بە کە هەمو کردەوە چاکەکانت هەڵدەوەشێتەوە ئەوسا تۆیش لە ڕەنجەڕۆیان دەبیت.

(٦٦) بەڵکو بەس ﷲ بپەرستەو لەگەڵ سوپاسگوزاراندا بە.

أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ ٱللَّهَ هَدَىٰنِى لَكُنتُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾ أَوْ تَقُولَ حِينَ تَرَى ٱلْعَذَابَ لَوْ أَنَّ لِى كَرَّةً فَأَكُونَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٥٨﴾ بَلَىٰ قَدْ جَآءَتْكَ ءَايَٰتِى فَكَذَّبْتَ بِهَا وَٱسْتَكْبَرْتَ وَكُنتَ مِنَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٩﴾ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ تَرَى ٱلَّذِينَ كَذَبُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ ۚ أَلَيْسَ فِى جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٦٠﴾ وَيُنَجِّى ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ ٱلسُّوٓءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ وَكِيلٌ ﴿٦٢﴾ لَّهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۗ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْخَٰسِرُونَ ﴿٦٣﴾ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿٦٦﴾ وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتٌۢ بِيَمِينِهِۦ ۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾

(٦٧) وەك پێویست ڕێزیان لە ﷲ نەگرتووەو بەچاکی نایناسن، خۆ هەر حەوت زەوییەکان هەمویان لەناو مشتی ئەودان، لە ڕۆژی قیامەتیشدا بە دەستی ڕاستی ئاسمانەکان دەپێچێتەوە. پاکو بێعەیبەو بەرزترە لەوەی کە هاوبەشی بۆ دابنێن. دەڵێن: جارێکیان جولەکەیەك هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی محمد بێگومان کە ﷲ ئاسمانەکان دەخاتە سەر پەنجەیەکیو هەمو دروستکراوەکانی تریش دەخاتە سەر پەنجەیەکی تریو پاشان دەفەرموێ: من پادشام، جا پێغەمبەر ﷺ پێکەنی تا ددانی پێش خڕیی دەرکەوت، پاشان فەرموی: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ﴾ وە لە فەرمودەیەکی تردا هاتوە کە عائیشە (خوالێی ڕازی بێ)پرسیاری ئەم ئایەتەی لە پێغەمبەر ﷺ کردو دەڵێ: وتم ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەی ئەو کاتە خەڵك لەکوێ دەبن؟ فەرموی:{عَلَى جِسرِ جَهَنَّم/ وَفِي رواية /عَلَى الِصرَاطِ يَا عَائِشَة/مسلم/ واتە: لەسەر پردی دۆزەخن، لە ڕیوایەتی تردا هاتوە: ئەی عائیشە لەسەر ئەو ڕێگای پردی دۆزەخن}

(٦٨) جا بەفەرمانی ﷲ، کە فووکرا بە کەڵەشاخدا لەلایەن ئیسرافیلەوە ئەو کاتە هەرچی گیانلەبەر هەیە لەناو ئاسمانەکانو لەناو زەویدا بێهۆش دەبنودەمرن جگە لەوانەی

وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾ وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٩﴾ وَوُفِّيَتۡ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا عَمِلَتۡ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَا يَفۡعَلُونَ ﴿٧٠﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ جَهَنَّمَ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا فُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ رُسُلٞ مِّنكُمۡ يَتۡلُونَ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ رَبِّكُمۡ وَيُنذِرُونَكُمۡ لِقَآءَ يَوۡمِكُمۡ هَٰذَاۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَلَٰكِنۡ حَقَّتۡ كَلِمَةُ ٱلۡعَذَابِ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ٱدۡخُلُوٓاْ أَبۡوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ فَبِئۡسَ مَثۡوَى ٱلۡمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ إِلَى ٱلۡجَنَّةِ زُمَرًاۖ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءُوهَا وَفُتِحَتۡ أَبۡوَٰبُهَا وَقَالَ لَهُمۡ خَزَنَتُهَا سَلَٰمٌ عَلَيۡكُمۡ طِبۡتُمۡ فَٱدۡخُلُوهَا خَٰلِدِينَ ﴿٧٣﴾ وَقَالُواْ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعۡدَهُۥ وَأَوۡرَثَنَا ٱلۡأَرۡضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلۡجَنَّةِ حَيۡثُ نَشَآءُۖ فَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾

که (الله) ویستی لەسەرمانیانە ، پاشان جارێکی تر فووی پێدا دەکرێت ، ئەوسا دەست بەجێ هەڵدەسنەوە کە بە چاوی خۆیان دەیبینن.

ئەبو هورەیرە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی کە فەرمویەتی:{ مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ /البخاري/ کەنێوانی ئەو دوو فوو پێدا کردنە چلە} بەڵام ئەوچلە رون نەکراوەتەوە کە رۆژە یان مانگە یان ساڵ.

﴿٦٩﴾ ئەوسا زەوی بە ڕوناکی پەروەردگاری شەوق دەداتەوەو نامەی کرەوەکان دادەنرێتو پێغەمبەران (درودی خوایان لێ بێت) دەهێنرێن بۆ ئەوەی شایەتی بدەنو بڵێن کە ئێمە پەیامی (الله)مان بەوان گەیاندوەو شایەتەکانیش دەهێنرێن کە فریشتەی نوسەری چاکو خراپی بەندەکانە، جا بەڕاستو دادپەروەرانە لە نێوانیاندا بڕیار دەدرێتو ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت.

﴿٧٠﴾ ئەوسا هەمو کەسێك پاداشتی ئەوەی پێدەدرێت کە کردویەتی، جا خوا خۆی لەهەمو کەس زاناترە کە چی دەکەن.

﴿٧١﴾ جا ئەو کەسانەی کە خوانەناس بون بەرەو دۆزەخ دەدرێنە بەر پۆل پۆل تا دەچنە لای، دەرگاکانی دەکرێتەوەو دەرگاوانی دۆزەخ پێیان دەڵێت: ئایا پێغەمبەرانێك لە خۆتان نەهاتنە لاتان کە نیشانەگەلی پەروەردگارتانی بەسەرتاندا خوێندبێتەوەو لە گەیشتن بەم ڕۆژەی ترساندبن؟ وتیان: بەڵێ هاتە لامان، بەڵام وشەی سزا لەسەر خوانەناسان هاتەدیو جێگای خۆی گرت، مەبەست ئەو بڕیارەی (الله)یە کە بە شەیتانی فەرمو:﴿بەراستی دۆزەخ پڕ دەکەم لە تۆو لەوانەش کە پەیڕەوی لە تۆ دەکەن هەموتان﴾صاد/٨٥.

﴿٧٢﴾ وترا لە دەرگاکانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە کە بۆ هەمیشە تێیدا بن ، جا چەند خراپە جێگای خۆبەزلزانان. ئینجا قورئان وەك باوی خۆی پاش باسی خراپان باسی چاکان دەکاتو دەفەرموێ:

﴿٧٣﴾ جا ئەو کەسانەی کە خۆیان پاراست بو لە سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاریان پۆل پۆل بەسواری بەرەو بەهەشت دەبرێن تا ئەو کاتەی کە پێی دەگەنو دەرگاکانی دەکرێنەوەو دەرگاوانی بەهەشت پێشوازیان لێدەکاتو پێیان دەڵێ: درود بۆ ئێوە، پاك کرانەوەو هیچ ناپوختیەکتان پێوە نەماوە ، جا بچنە ناو بەهەشتەوەو بۆ هەمیشە تێیدا بن.

﴿٧٤﴾ ئەوانیش دەڵێن: تەواوی سوپاس هەر شایستەی (الله)یە ئەو زاتەی کە بەڵێنیٔ خۆی هێنایە دی بۆمان، وە ئەم زەویەی پێداین کە لە هەر کوێدا ئارەزۆمان لێ بێت تێیدا دادەنیشین، وای چەند چاکە پاداشتی ئیشکەرانی ڕاستەقینە. لە فەرمودەدا هاتوە کە: { أَنَّ مَا بَيْنَ مِصْرَاعَيْنِ مِنْ مَصَارِيعِ الْجَنَّةِ مَسِيرَةُ أَرْبَعِينَ سَنَةً وَلَيَأْتِيَنَّ عَلَيْهَا يَوْمٌ وَهُوَ كَظِيظٌ مِنَ الزِّحَامِ /مسلم/ پانایی هەر دەرگایەك لە دەرگاکانی بەهەشت چل ساڵ ڕێگایەو ڕۆژێ دێت کە لەبەر زۆری خەڵك قەرەباڵغ دەبێ.

﴿٧٥﴾ جا فریشتەکانیش دەبینیت کە لە چواردەوری عەرشدا دەخولێنەوەو لەگەڵ سوپاسی پەروەردگاریان بە پاكو بێ عەیبی یادی دەکەن ئەوسا لەنێوانیاندا بەڕاستی فەرمان

دراوو بێژرا تەواوی سوپاس شایستەی (ﷲ)یە کە پەروەردگاری جیهانیانە.

٤٠ سورەتی غافر ٨٥

سورەتی غافر کە سورەتی چل هەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، هەشتاو پێنج ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستەمەو پاش سورەتی (الزمر) و پێش (فصلت) دابەزیوە، کەواتە پێش هەمو سورەتە "حا میم" ـە کان دابەزیوە.

وشەی ﴿غَافِرِ﴾ واتە داپۆشەرو لێبوردە لە گوناه، یەکێکە لەناوە بەرزەکانی پەروەردگار کە بەم کیشە لە قورئاندا یەکجار لە ئایەتی سێهەمی ئەم سورتەدا هاتوە، هەروەها ئەم سورەتە بەم ناوانەش دەناسرێت: (المؤمن، الطَّوْل)

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١) حا، میم.

(٢) دابەزینی ئەم پەڕاوە کە قورئانە لەلایەن (ﷲ)ی دەسەڵاتداری زۆر زاناوەیە کە خاوەنی ئەم وەسفانەیە،

(٣) چاوپۆشی کارە لە گوناحو وەرگری تەوبەو پەشیمانیەو تۆڵەی سەختەو خاوەن بەخشش‌و کەرەمی زۆرەو جگە لەو هیچ پەرستراوێکی تری ڕاستەقینە نیە، سەر ئەنجام گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

(٤) جگە لەو کەسانەی کە خوا نەناسن کەسی تر لەبارەی نیشانەکانی (ﷲ) وە دەمە قاڵە ناکات ، جا هاتوچویان بۆ وڵاتان با تۆ نەخەڵەتێنێ، چونکە ئەمە شتێکی کەمەو سەرئەنجامیان نەمان‌و چونە ناو ئاگرە.

(٥) پێش ئەم گەلەی تۆ گەلی نوحو پارتەکانی تری پاش ئەوانیش باوەڕیان نەکرد بە پێغەمبەرەکانیان‌و هەمو گەلێکیش نیەتو هەڵوێستی خراپیان هەبوە لەگەل پێغەمبەری خۆیاندا بە گرتن‌و کوشتن‌و بە قسەی پوچیش کێشەیان لەگەڵدا کردوون بۆ ئەوەی ڕاستی بشکێنن ، ئەوسا من گرتومن‌و تۆڵەم لێ سەندون ، جا بزانە چۆن بوە تۆڵەی من بۆ ئەو گەلە ناپەسەندە؟

(٦) خۆ بەڵێنی پەروەردگاری تۆ هەر ئاوەها لەسەر خوانەناسان هاتەدی، بێگومان ئەوانە یارانی ئاگرن و دۆزەخیین.

وَتَرَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ حَآفِّينَ مِنۡ حَوۡلِ ٱلۡعَرۡشِ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡۚ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَقِيلَ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٥﴾

٤٠ سُورَةُ غَافِرٍ ٨٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلۡكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿٢﴾ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ شَدِيدِ ٱلۡعِقَابِ ذِي ٱلطَّوۡلِۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ إِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٣﴾ مَا يُجَٰدِلُ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَلَا يَغۡرُرۡكَ تَقَلُّبُهُمۡ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ﴿٤﴾ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۖ وَهَمَّتۡ كُلُّ أُمَّةِۭ بِرَسُولِهِمۡ لِيَأۡخُذُوهُۖ وَجَٰدَلُواْ بِٱلۡبَٰطِلِ لِيُدۡحِضُواْ بِهِ ٱلۡحَقَّ فَأَخَذۡتُهُمۡۖ فَكَيۡفَ كَانَ عِقَابِ ﴿٥﴾ وَكَذَٰلِكَ حَقَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ عَلَى ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ أَنَّهُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ يَحۡمِلُونَ ٱلۡعَرۡشَ وَمَنۡ حَوۡلَهُۥ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيُؤۡمِنُونَ بِهِۦ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَا وَسِعۡتَ كُلَّ شَيۡءٖ رَّحۡمَةٗ وَعِلۡمٗا فَٱغۡفِرۡ لِلَّذِينَ تَابُواْ وَٱتَّبَعُواْ سَبِيلَكَ وَقِهِمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٧﴾

(٧) ئەو فریشتانەی کە عەرشیان هەڵگرتوەو ئەوانەش کە لە چواردەوریدان پەروەردگاری خۆیان بە پاك‌و بێ عەیب وەسف دەکەن لەگەڵ سوپاس کردنیداو باوەڕیان بەو هەیەو داوای لێبوردن دەکەن بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو دەڵێن ـ ئەی پەروەردگارمان بەزەیی تۆ هەمو شتێکی گرتوەتەوەو زانیاریەکەیشت زۆرەو هەمو شت دەزانیت ، سا ببورە لەو کەسانەی کە پەشیمان بونەتەوە لە تاوان‌و شوێن ڕێگاکەی تۆ کەوتون، وەلە سزای دۆزەخ بیانپارێزە.

(٨) ئەی پەروەردگارمان هەروەکو لێیان دەبوریت بیانخەرە ناو ئەو باخاتە هەمیشەییەی کە بەڵێنت پێداون‌و ئەو کەسانەی کە چاکە کار بون لە باو باپیران‌و هاوسەران‌و منداڵ‌و نەوەکانیانیشیان بەڕاستی تۆ خۆتیت دەسەڵاتدار بەسەر هەمو شتێکداو لێزانیت لە کاروباریان.

(٩) سا لە خراپە بیانپارێزەو چاوپۆشیان لێ بکە، خۆ هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا لە تۆڵەی خراپە پاراستت بەڕاستی بەزەییت بەودا هاتوەتەوەو ڕەحمت پێکردوە، وە ئەوەش هەر خۆی سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ ئەوان. جا تەماشا بکەن کە فریشتەکان بۆ ئێمەی باوەڕدار دەپاڕێنەوەو داوای لێبوردن‌و بەهەشتمان بۆ دەکەن‌و دەپاڕێنەوە لە خوا لە ئاگری دۆزەخ

رَبَّنَا وَأَدْخِلْهُمْ جَنَّاتِ عَدْنٍ الَّتِي وَعَدتَّهُمْ وَمَن صَلَحَ مِنْ آبَائِهِمْ وَأَزْوَاجِهِمْ وَذُرِّيَّاتِهِمْ ۚ إِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٨﴾ وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ ۚ وَمَن تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾ إِنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا يُنَادَوْنَ لَمَقْتُ اللَّهِ أَكْبَرُ مِن مَّقْتِكُمْ أَنفُسَكُمْ إِذْ تُدْعَوْنَ إِلَى الْإِيمَانِ فَتَكْفُرُونَ ﴿١٠﴾ قَالُوا رَبَّنَا أَمَتَّنَا اثْنَتَيْنِ وَأَحْيَيْتَنَا اثْنَتَيْنِ فَاعْتَرَفْنَا بِذُنُوبِنَا فَهَلْ إِلَىٰ خُرُوجٍ مِّن سَبِيلٍ ﴿١١﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّهُ إِذَا دُعِيَ اللَّهُ وَحْدَهُ كَفَرْتُمْ ۖ وَإِن يُشْرَكْ بِهِ تُؤْمِنُوا ۚ فَالْحُكْمُ لِلَّهِ الْعَلِيِّ الْكَبِيرِ ﴿١٢﴾ هُوَ الَّذِي يُرِيكُمْ آيَاتِهِ وَيُنَزِّلُ لَكُم مِّنَ السَّمَاءِ رِزْقًا ۚ وَمَا يَتَذَكَّرُ إِلَّا مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ فَادْعُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴿١٤﴾ رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ يُلْقِي الرُّوحَ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَن يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ لِيُنذِرَ يَوْمَ التَّلَاقِ ﴿١٥﴾ يَوْمَ هُم بَارِزُونَ ۖ لَا يَخْفَىٰ عَلَى اللَّهِ مِنْهُمْ شَيْءٌ ۚ لِّمَنِ الْمُلْكُ الْيَوْمَ ۖ لِلَّهِ الْوَاحِدِ الْقَهَّارِ ﴿١٦﴾

دورمان بخاتەوە ، ئەی بۆ ئێمە خۆمان ئەوەندەی ئەوان ناپارێینەوەو خەمی خۆمان ناخۆین؟! لە فەرموودەدا هاتووەکە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: {إذا دَعَا المُسلم لأخِيهِ بِظَهر الغَيبِ قَال المَلَكَ: آمِين، وَلَكَ بِمِثلِهِ/مسلم/ هەر کاتێك موسڵمانێك لەپاش ملە دوعای کرد بۆ برای ئایینی خۆی ئەو فریشتەی کە مەئمورە دەڵێت: خودایە لێی وەرگرەو بۆ تۆش ئەی موسڵمانەکە هەر بە وێنەی ئەو بێت}.

(١٠) بێگومان ئەو کەسانەی کە خوایان نەناسیوە لەلایەن فریشتەکانەوە بانگ دەکرێن‌و پێیان دەڵێن: بەڕاستی تورەیی الله لە مرۆژەدا گەورەترە بۆ ئێوە لە تورەیی خۆتان لە ئایین‌و پێغەمبەر ﷺ ئەو کاتەی کە بانگ دەکران بۆ باوەڕ کەچی ئێوە سپڵەو نمەك نەناس‌و بێباوەڕبون.

(١١) جا ئەوکاتە بێباوەڕان دەڵێن: پەروەردگارمان تۆ دووجار ئێمەت مراندوەو دوو جاریش زیندووت کردینەوە ، جا دان بە گوناهی خۆماندا دەنێین دەسا هیچ ڕێگایەك هەیە بۆ دەرچون لەم ئاگرەو گەڕانەوە بۆ دنیا؟ وەڵامیان: نەخێر، تازە گەڕانەوە نیە.

(١٢) ئەو سزایەی کە ئەمڕۆ تێیدان بەهۆی ئەویە کە هەر کاتێك الله بەتەنهایی بانگ بکرێت ئێوە بێباوەڕ دەبن پێی، خۆ ئەگەر هاوەڵی بۆ دابنرێت باوەڕ دەکەن، جا بڕیار هەر بۆ(الله)ی بالادەست‌و گەورەیە.

(١٣) الله ئەو زاتەیە کە نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەداتو لە ئاسمانەوە ڕۆزیتان بۆ دەنێرێت بەهۆی بارانەوە ، بە لام بیر ناکاتەوەو سود لەم ڕاستیانە وەرناگرێت جگە لەو کەسەی کە بەرەو الله بگەڕێتەوەو هەر ڕەزامەندی ئەوی مەبەستبێ.

(١٤) دەی ئێوەش بە دڵپاکیەوە الله بیپەرستن وخۆتان یەکلا بکەنەوە بۆی هەرچەند خوانەناسانیش پێیان ناخۆش بێت. لە فەرموودەدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پاش هەموو نوێژە فەرزەکان دەیفەرمو: {لا إله إلَّا الله وَحدَهُ لا شَريَكَ لَهُ، لَهُ المُلكُ وَلَهُ الحَمد، وَ هُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدير، لا حَول وَلا قُوَّةَ إلَّا بِالله، لا إله إلَّا الله وَلا نَعبُدُ إلَّا إيَاه، لَه النِعمَةُ وَ لَهُ الفَضل، وَلَهُ الثَّنَاءُ الحَسَنُ، لا إله إلَّا الله مُخلَصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَو كَرِهَ الكَافِرون/ مسلم، احمد/ جگە لە الله هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو تەنهایەو هاوبەشی نیە، دەسەڵات‌و هێز هەرهی ئەو زاتەیەو هەر بۆ ئەوە سوپاس‌و بەسەر هەموو شتێکدا توانای هەیەو هیچ گۆڕێنەرێك‌و هیچ توانایەك نیە مەگەر بە الله، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لە (الله)و هەر ئەو دەپەرستین نیعمەت‌و ڕێز هەر موڵکی ئەوەو هەر بۆ ئەوە سوپاسی جوان، هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیە جگە لە الله ، وە هەر بۆ ئەویشە ئایینی بێ غەل وغەش هەر چەند خوانەناسانیش پێیان ناخۆشبێت}

(١٥) پلەو مەقامی زۆربەرزە، خاوەنی عەرشە هەندێك لەفەرمانی خۆی کە مایەی ژیانی سەربەستانەی دنیاو قیامەتە دەنێرێت بۆ کەسێك کە ئارەزوی لێ بیت لە بەندەکانی بۆئەوەی خەڵك بترسێنێ لەو ڕۆژەی کە ڕۆژی بەیەك گەیشتنە، مرۆڤ وکردارەکانی، خەڵکی ئاسمان‌و زەوی، عابیدو مەعبود، ڕاست وناڕاست، ستەم لێکراوو ستەمکار.

(١٦) ئەو ڕۆژەی کە ئەوان دێنەدەرەوەو ئاشکرا دەبن وهیچیان لە الله ناشارێتەوە، جارچی جاڕ دەدات و دەڵێت: ئەمڕۆ دەسەڵات بەدەست کێیە؟ وەڵام دەدرێتەوە، دەسەڵات تەنها بەدەست (الله)ی تاك‌و زاڵ بەسەر هەموو شتێکدایەو کەسی تر هیچی لە دەستدانیە.

لەفەرموودەدا هاتوەکە لەرۆژی قیامەتدا خوای بالادەست دەفەرموێ: {أَنَا الْمَلِكُ أَيْنَ مُلُوكُ الْأَرْضِ /البخاری/ هەرمنم پاشا کوا پاشاکانی زەوی؟}.

ٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَىٰ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡۚ لَا ظُلۡمَ ٱلۡيَوۡمَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴿١٧﴾ وَأَنذِرۡهُمۡ يَوۡمَ ٱلۡأٓزِفَةِ إِذِ ٱلۡقُلُوبُ لَدَى ٱلۡحَنَاجِرِ كَٰظِمِينَۚ مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ﴿١٨﴾ يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ يَقۡضِي بِٱلۡحَقِّۖ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَقۡضُونَ بِشَيۡءٍۗ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٢٠﴾ ۞ أَوَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ مِن قَبۡلِهِمۡۚ كَانُواْ هُمۡ أَشَدَّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗ وَءَاثَارٗا فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُ بِذُنُوبِهِمۡ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن وَاقٖ ﴿٢١﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانَت تَّأۡتِيهِمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَكَفَرُواْ فَأَخَذَهُمُ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ قَوِيّٞ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَا وَسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ ﴿٢٣﴾ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَقَٰرُونَ فَقَالُواْ سَٰحِرٞ كَذَّابٞ ﴿٢٤﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡحَقِّ مِنۡ عِندِنَا قَالُواْ ٱقۡتُلُوٓاْ أَبۡنَآءَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَعَهُۥ وَٱسۡتَحۡيُواْ نِسَآءَهُمۡۚ وَمَا كَيۡدُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ ﴿٢٥﴾

(١٧) هەر ئەمڕۆ هەموو کەسێك پاداشت دەدرێتەوە بەگوێرەی ئەو کارو کۆششەی کە کردویەتی چاك بە چاكو خراپیش بەخراپ، وە ئەمڕۆ هیچ جۆرە ستەمێك نیە، بێگومان کە الله لە حیسابدا بە پەلەیە.

(١٨) جا لەو ڕۆژە نزیکە کە قیامەتە بیانترسێنە ، ئەو کاتەی کە دڵەکان دێنە قوڕگ لە ترساو هەموویان هەر پیش دەخۆنەوە لە داخو خەمدا، جا بۆ ستەمکاران لەو رۆژەدا نەخزمو دۆستێك هەیەو نە تکاکارێکی بەگوێکراو.

(١٩) الله دەزانێت بەخیانەتی چاوە خیانەتکارەکانو بە ئەوەیش کە دڵەکاندایەو نەیاندرکاندوەو کەس پێی نەزانیوە.

(٢٠) خۆ الله بەڕاستی بڕیار دەداتو ئەو کەسانەی کە دەیانپەرستن بێجگە لە ئەو هیچ شتێکیان لەدەست نایەت، بەبێ شك کە الله بیسەری هەموو قسەو گوفتارێکەو بینەری هەموو کردارێکە. بیربکەرەوە کەهەمیشە ئاوا چاودێرێکت لەسەرە.

(٢١) ئایا هەروا بێ ئاگانو بەناو ئەم زەویدا نەگەڕاون، جا تەماشا بکەن و بزانن کە پاشەرۆژی ئەو کەسانەی کە لەپێش ئەواندا بووە چۆنی بەسەرهاتوە کە ئەوان لەم موشریکانەی ئێستایش بەهێزتر بوون و شوێنەواریشیان لەم زەویدا لەمان زیاترو بتەوتر بووە ، جا الله بەهۆی گوناهەکانیانەوە تۆڵەی لێ سەندنو هیچکەسێکیان نەبو کە لە تۆڵەی الله ڕزگاریان بکات، دەی ئێوەش ئەی ئوممەتی محمد ﷺ جا تا ئاوا ڕۆژێك یەخەی نەگرتون با بەرەو پەروەردگاری خۆتان بگەڕێنەوەو خۆتان لە خۆ پەرستی ودنیا پەرستی رزگار بکەن.

(٢٢) ئەو سزایەش لەبەر ئەوەبو کە ئەوان پێغەمبەرانیان بە بەڵگەی ڕۆشنەوە بۆ هات ، بەڵام ئەوان باوەڕیان پێ نەکردن ، ئەوسا ئێمەش تۆڵمان لێ سەندن بەڕاستی ئەو زاتە بە هێزەو تۆڵەی توندە. ئینجا پەروەردگار هەندێ لە بەسەرهاتی موسا (عليه السلام) لەگەڵ فیرعەونو دارو دەستەتەکەی بۆ ئەم گەلە باس دەکات تا زیاتر خووڕەوشتی دوژمنانی ئایین بناسنو فێری نەترسیو حەق وێژیمان بکاتو دەفەرموێ:

(٢٣) بەراستی ئێمە موسامان بە نیشانە گەلی خۆمانو بەڵگەی ڕۆشنەوە رەوانە کرد،

(٢٤) بۆلای فیرعەونو هامانو قارون، جا کاتێك کە قسەی لەگەڵدا کردن وتیان: جادوگەرێکی زۆر درۆزنە.

(٢٥) جا کاتێك بەو ڕاستیەی کە لە لایەن ئێمەوە پێیگەیشتبو هاتە لایان وتیان: کوڕانی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێهێناوە بکوژن وکچانیان دەست لێ مەدەن ، ئەوویش بۆخزمەت پێکردنو داوێن پیسی وسەرشۆڕکردنی نەوەی ئیسرائیل، جا پەروەردگار دەفەرموێ: فروفێڵی خوا نەناسان جگە لە سەر لێشێواوی شتێکی تر نیەو سەر ئەنجامی ستەمکارانو خوا نەناسان هەر تێشکان و تیاچونە.

(٢٦) جا فیرعەون وتی: وازم لێ بێنن با موسا بکوژم ، جا با بانگ بکاتە پەروەردگاری خۆی! بێگومان من دەترسم کە موسا دینەکاتان بگۆڕێت یان لەم زەویدا خراپە بڵاو بکاتەوە، بەڵێ ئەوە قسەی پیاو خراپانو ستەمکارانە لە هەموو سەردەمێکدا تەماشا بکەن فیرعەون خۆی سەرتاپای لوت بەرزیو خوێن مژیو خراپەکارییە وا ئێستا فرمێسکی تیمساحی دەڕژێنێ بۆ خەیرو خۆشی گەلەکەیو ئایینەکەیان، ناڵێ کورسیم لە مەترسیدایە، دەڵێت گەل لە مەترسیدایە، ئایینتان لە مەترسیدایە؟! وتراوە"چەند سەیرە لەیەکچونی ئەمڕۆ و دوێنێ "

(٢٧) جا موسایش (عليه السلام) وتی: بێگومان من بە پەروەردگاری خۆمو ئێوە پەنا دەگرم لە شەڕی هەموو خۆبەزلزانێك کە باوەڕی بە ڕۆژی قیامەتو حیساب نەبێت.

(٢٨) جا پیاوێکی باوەڕدار لە ئالی فیرعەن کە لەترسی ستەمی فیرعەون باوەڕداری خۆی دەرنەخست بو، ناتوانێ لەم ستەمە گەورەی فیرعەون بێدەنگ بێتو وتی: پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت:

وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ ذَرُونِيٓ أَقۡتُلۡ مُوسَىٰ وَلۡيَدۡعُ رَبَّهُۥٓۖ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يُبَدِّلَ دِينَكُمۡ أَوۡ أَن يُظۡهِرَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ٱلۡفَسَادَ ﴿٢٦﴾ وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِنِّي عُذۡتُ بِرَبِّي وَرَبِّكُم مِّن كُلِّ مُتَكَبِّرٖ لَّا يُؤۡمِنُ بِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿٢٧﴾ وَقَالَ رَجُلٞ مُّؤۡمِنٞ مِّنۡ ءَالِ فِرۡعَوۡنَ يَكۡتُمُ إِيمَٰنَهُۥٓ أَتَقۡتُلُونَ رَجُلًا أَن يَقُولَ رَبِّيَ ٱللَّهُ وَقَدۡ جَآءَكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ مِن رَّبِّكُمۡۖ وَإِن يَكُ كَٰذِبٗا فَعَلَيۡهِ كَذِبُهُۥۖ وَإِن يَكُ صَادِقٗا يُصِبۡكُم بَعۡضُ ٱلَّذِي يَعِدُكُمۡۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ مُسۡرِفٞ كَذَّابٞ ﴿٢٨﴾ يَٰقَوۡمِ لَكُمُ ٱلۡمُلۡكُ ٱلۡيَوۡمَ ظَٰهِرِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَمَن يَنصُرُنَا مِنۢ بَأۡسِ ٱللَّهِ إِن جَآءَنَاۚ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُم مِّثۡلَ يَوۡمِ ٱلۡأَحۡزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثۡلَ دَأۡبِ قَوۡمِ نُوحٖ وَعَادٖ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوۡمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ يَوۡمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوۡمَ تُوَلُّونَ مُدۡبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنۡ عَاصِمٖۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٖ ﴿٣٣﴾

پەروەردگارم (ﷲ)یەو بەڵگەی ڕۆشنی لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون؟! ئەگەر ئەو درۆزنیش بێت خۆ ئەوە سزای درۆکەی هەر بۆ خۆیەتیو ئەگەر ڕاستیش بکات هەندێ لەو شتانەی کە هەڕەشەی پێدەکات لێتان دوچارتان دەبێت، بەڕاستی ﷲ ئەو کەسەی کە زیادەڕەوەو درۆزنە ڕێنمونی ناکات بۆ ڕێگای ڕاستو هەرگیز خۆشبەخت نابێت.

لە فەرمودەدا هاتوە لەعوروەی کوڕی زوبەیرەوەکەوتی: لەبارەی سەخت ترین شتێك کە بت پەرستان بە پێغەمبەری خوایان ﷺ کردبێت لە عەبدوڵای کوڕی عەمرم پرسی وتی:{ رَأَيْتُ عُقْبَةَ بْنَ أَبِي مُعَيْطٍ جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَهُوَ يُصَلِّي فَوَضَعَ رِدَاءَهُ فِي عُنُقِهِ فَخَنَقَهُ بِهِ خَنْقًا شَدِيدًا فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ حَتَّى دَفَعَهُ عَنْهُ فَقَالَ أَتَقْتُلُونَ رَجُلًا أَنْ يَقُولَ رَبِّيَ اللَّهُ وَقَدْ جَاءَكُمْ بِالْبَيِّنَاتِ مِنْ رَبِّكُمْ/البخاری/ دیم کە عوقبەی کوڕی ئەبو موعەیت هات بۆلای پێغەمبەرﷺکە نوێژی دەکرد جا بەرماڵکەی خستە ملیو تاساندی بەتاساندنێکی زۆرتوند، جا ئەبوبەکر هاتو پاڵی پێوە ناوو لەسەری لای برد، ئینجا وتی: پیاوێك دەکوژن کە دەڵێت: پەروەردگارم (ﷲ)یەو بەڵگەی ڕۆشنی لە پەروەردگارتانەوە بۆ هێناون؟!} .

﴿٢٩﴾ ئەی گەلی من ئەمرۆ دەسەڵات هی ئێوەیەو زاڵن لەسەر ئەو زەویەدا ، جا ئەگەر سزای ﷲ هات کێ یارمەتیمان دەدات بۆ ڕزگاربونمان؟ فیرعەون وتی: هیچ شتێك پیشانی ئێوە نادەم مەگەر ئەوەی کە خۆم بەچاکی دەزانمو ڕێنمونیتان ناکەم مەگەر بۆ ڕێگای چاكو ڕاست.

﴿٣٠﴾ جا ئەو کەسەی کە خواناس بو وتی: ئەی گەلی من بەڕاستی من لێتان دەترسم لە وێنەی ڕۆژی پارتەکان.

﴿٣١﴾ وەکو نەریتی گەلی نوحو عادو سەمودو ئەو کەسانەش کە لە پاش ئەواندا هاتن، چییان بەسەرهات ئەوەش بەسەر ئێمەدا بێت، بەڕاستی ﷲ نایەوێت هیچ جۆرە ستەمێك لە هیچ بەندەیەکی خۆی بکات.

﴿٣٢﴾ ئەی گەلی من بەڕاستی لێتان دەترسم لەو ڕۆژەی کە ڕۆژی هاوار هاوارە لە یەکترو کەس بەدەم کەسەوە نایەتو کەس لەبەر گرفتاری خۆی لە بیری کەسی تردا نیە.

﴿٣٣﴾ ئەو ڕۆژەی کە پشت لەیەك دەکەنو ڕاو ڕاوانەو بێ مەبەست دێنو دەچن، هیچ پارێزەرێکتان نیە لەو ڕۆژەدا لە ﷲ پەناتان بداتو ڕزگارتان بکاتو هەر کەسێکیش کە ﷲ ڕێی لێ گوم بکات ، ئەوسا ئیتر هیچ ڕێ پیشاندەرێکی تری نیە.

﴿٣٤﴾ بەڕاستی لە پێشدا یوسف عليه السلام هاتە لاتان بە بەڵگە گەلی ڕوون ، بەڵام ئێوە هەر لە گوماندا بون لەوەی کە بۆی هێنا بون تا وەفاتی کرد، ئەوەبو وتتان: هەرگیز ﷲ پاش ئەو پێغەمبەرێکی تر ڕەوانە ناکات، واتە تا مابو باوەڕیان نەبو کە پێغەمبەرە بەڵام کاتێك کەوەفاتی کرد دەیان وت: پێغەمبەری تری وەکو ئەو نایەت! هەر ئاوەها ﷲ ئەو کەسەی کە زیادەڕەوە لە تاواندا و بە گومانە لە ئایینو پێغەمبەرانی، ڕێنمایی ناکات ونایگەیەنێت بە خۆشبەختی پاشەڕۆژ.

(٣٥) ئەو کەسانەی کە لەبارەی نیشانەکانی (اللَّهُ)وە کێشە دەکەن بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ، ڕقو کینی گەورە هەیە لەلایەن (اللَّهُ)وە لەلایەن باوەڕدارانیشەوە، جا چۆن سەری لێتێکدان هەر ئاوەهاش اللَّهُ مۆر دەنێت بەسەر دڵی هەموو خۆ بەزلزانێکی زۆردارەوە. قەتادە دەڵێت: (نیشانەی مرۆڤی ستەمکار کوشتنی خەڵکە بە ناحەق).

(٣٦) جا فیرعەون وتی: ئەی هامان قەڵایەکم بۆ دروست بکە بەڵکو بگەم بە ڕێگاوهۆگەلێك.

(٣٧) ڕێگاکانی سەرکەوتن بۆ ئاسمانەکان ، سا بەڵکو لەوێوە هەواڵێك لە خوای موسا بزانم، وە بێ شك من وا گومان دەبەم کە ئەو درۆ دەکات، فیرعەون کردارە ناشیرینەکانی بۆ جوانکراو ڕێگای ڕاستی لێگیراو فرۆفێڵی فیرعەونیش جگە لە تیاچونی خۆی شتێکی تری بەدواوە نەبو.

(٣٨) جا ئەو کەسەی باوەڕی هێنابو وتی: ئەی گەلی من دوام بکەون من ڕێگای باشتان نیشان دەدەم کە ڕێگای یەکخواپەرستیە.

(٣٩) ئەی گەلی خۆم ئەم دنیایە هەر تەنها خۆشیەکەو دەبڕێتەوە، بێگومان دواڕۆژ هەر خۆیەتی ماڵی ئارامگرتن بە یەکجاری‌و هەرگیز کۆتایی نایەت، جا یان نازو نیعمەت‌و ڕابواردنی هەمیشەییە، یان دۆزەخ‌و کێم‌و ئاگری هەمیشەیی جا ئەم ژیانە کێڵگەیەکە بۆ ئەو ژیانەو چی بکەیت ئەوە دروێنە دەکەیت وەکو دەفەرموێ:

(٤٠) هەر کەسێك ئیشێکی خراپ بکات هەر تەنها بە یەك خراپە لە شێوەی خۆی تۆڵەی لێوەردەگیرێت‌و هەر کەسێکیش ئیشی چاك بکات نێر بێ یان مێ بێ‌و ئەو باوەڕدار بێت ئەوە ئەوانە دەچنە ناو بەهەشتەوە، جا لەوێدا بەبێ ژمارە ڕۆزیان پێدەدرێت.

(٤١) ئەی گەلی خۆم ئەوە چیمە من ئێوە بانگ دەکەم کە ڕزگارتان بکەم لە ئاگر کەچی ئێوە من بانگ دەکەن بۆ لای ئاگر!

(٤٢) بانگم دەکەن تا بێباوەڕبم بە (اللَّهُ)و هاوبەشی بۆ دانێم کە من بچوکترین زانیاریم نیە لەسەر ئەوەی کە اللَّهُ هیچ

وَلَقَدْ جَآءَكُمْ يُوسُفُ مِن قَبْلُ بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَمَا زِلْتُمْ فِى شَكٍّ مِّمَّا جَآءَكُم بِهِۦ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا هَلَكَ قُلْتُمْ لَن يَبْعَثَ ٱللَّهُ مِنۢ بَعْدِهِۦ رَسُولًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَنْ هُوَ مُسْرِفٌ مُّرْتَابٌ ﴿٣٤﴾ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ سُلْطَٰنٍ أَتَىٰهُمْ ۖ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ كَذَٰلِكَ يَطْبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلْبِ مُتَكَبِّرٍ جَبَّارٍ ﴿٣٥﴾ وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَٰهَٰمَٰنُ ٱبْنِ لِى صَرْحًا لَّعَلِّىٓ أَبْلُغُ ٱلْأَسْبَٰبَ ﴿٣٦﴾ أَسْبَٰبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ فَأَطَّلِعَ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّى لَأَظُنُّهُۥ كَٰذِبًا ۚ وَكَذَٰلِكَ زُيِّنَ لِفِرْعَوْنَ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَصُدَّ عَنِ ٱلسَّبِيلِ ۚ وَمَا كَيْدُ فِرْعَوْنَ إِلَّا فِى تَبَابٍ ﴿٣٧﴾ وَقَالَ ٱلَّذِىٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ ٱتَّبِعُونِ أَهْدِكُمْ سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٣٨﴾ يَٰقَوْمِ إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا مَتَٰعٌ وَإِنَّ ٱلْءَاخِرَةَ هِىَ دَارُ ٱلْقَرَارِ ﴿٣٩﴾ مَنْ عَمِلَ سَيِّئَةً فَلَا يُجْزَىٰٓ إِلَّا مِثْلَهَا ۖ وَمَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ يُرْزَقُونَ فِيهَا بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٤٠﴾

هاوبەشێکی هەبێت، وەمن ئێوە بانگ دەکەم بۆ لای ئەو دەسەڵاتدارە گەورەیە کە ئەم بونەوەرەی هێناوەتە دی‌و لەگەڵ ئەوهێز و دەسەڵاتە گەورەیەشدا زۆر لێبوردەیە لە تاوانی بەندەکانی.

(٤٣) بێگومان ئەوەی کە ئێوە منی بۆ بانگ دەکەن کە بەندایەتی بۆ بکەم توانای هیچی نیەو نایەت بەدەم کەسەوە نە لە دنیاداو نە لە دواڕۆژدا بێشك گەڕانەوەی هەمومانیش هەر بۆ لای (اللَّهُ)یەو بێگومان کە زیادەڕەوان لە تاوان‌و ستەمدا هەر بۆ خۆیان دۆزەخین، بەڵێ باوەڕدارەکەی ئالی فیرعەون درێژە بە قسەو ئامۆژگارییەکانی دەدات‌و دەڵێ:

(٤٤) سا بەم زوانە کاتێك کە سزاتان بۆ هات ئەو کاتە دەزانن من چیم پێ وتون‌و ئیشی خۆم دەسپێرم بە اللَّهُ بێگومان کەاللَّهُ بینەری بەندەکانیەتی‌و ئەوەی شایستەی ڕێنمای بێت ڕێنمای دەکات‌و ئەوەش کە شایستەی سەر لێشێوان بێت سەری لێتێك دەدات، ئەم پیاوە باوەڕدارە دڵسۆزە بۆ خۆی‌و گەلەکەی لە ئامۆژگاری‌و بانگەوازی یەکخواپەرستی‌و دژایەتی ملهوڕێکی وەکو فیرعەون کۆتایی نەکردو لە کاتی پێویستدا خۆی ئاشکرا کردو هەڵوێستی مەردانەی خۆی گرت، لەمەوە بەلای کەمەوە ئەوە فێر دەبین ئەگەر بە

﴿وَيَٰقَوۡمِ مَا لِيٓ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلنَّجَوٰةِ وَتَدۡعُونَنِيٓ إِلَى ٱلنَّارِ ٤١ تَدۡعُونَنِي لِأَكۡفُرَ بِٱللَّهِ وَأُشۡرِكَ بِهِۦ مَا لَيۡسَ لِي بِهِۦ عِلۡمٞ وَأَنَا۠ أَدۡعُوكُمۡ إِلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡغَفَّٰرِ ٤٢ لَا جَرَمَ أَنَّمَا تَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِ لَيۡسَ لَهُۥ دَعۡوَةٞ فِي ٱلدُّنۡيَا وَلَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ مَرَدَّنَآ إِلَى ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ ٤٣ فَسَتَذۡكُرُونَ مَآ أَقُولُ لَكُمۡۚ وَأُفَوِّضُ أَمۡرِيٓ إِلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَصِيرُۢ بِٱلۡعِبَادِ ٤٤ فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ٤٥ ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۖ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ٤٦ وَإِذۡ يَتَحَآجُّونَ فِي ٱلنَّارِ فَيَقُولُ ٱلضُّعَفَٰٓؤُاْ لِلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُنَّا لَكُمۡ تَبَعٗا فَهَلۡ أَنتُم مُّغۡنُونَ عَنَّا نَصِيبٗا مِّنَ ٱلنَّارِ ٤٧ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُوٓاْ إِنَّا كُلّٞ فِيهَآ إِنَّ ٱللَّهَ قَدۡ حَكَمَ بَيۡنَ ٱلۡعِبَادِ ٤٨ وَقَالَ ٱلَّذِينَ فِي ٱلنَّارِ لِخَزَنَةِ جَهَنَّمَ ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ يُخَفِّفۡ عَنَّا يَوۡمٗا مِّنَ ٱلۡعَذَابِ ٤٩﴾

جوانی سرنج لە ئایەتەکان بدەین کە خۆگرتنو بێدەنگیو خۆ حەشاردان ناگونجێت لەگەڵ بیروباوەڕێکی ڕاستو دروستدا ، ئەو پیاوە بە ئەو هەڵوێستە مەزنەی گەیشتە ئەو پلەیەی کە ﷲ دەفەرموێ:

(٤٥) جا بەهۆی ئەو دەعوەتو بانگەوازییەی کە لە دژی فیرعەونو دەستو دایرەکەی کردیﷲ لە تەنگو چەڵەمەو سەختیەکانی ئەو فرۆفێڵەی کە دژی دەکرا پاراستیو فیرعەونو دەستو دایرەکەیشی خراپترین سزای چەسپاند بەسەریاندا،

(٤٦) کە ئاگر بو کە هەمو ڕۆژێك بە بەیانیانو بە ئێواران ئەوان دەبرێنە سەر ئەو ئاگرەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا (دەوترێت) فیرعەونو دەستو دایرەی بخەنە ناو توندترین سزاوە. ئەمەش سەلمێنەری سزای گۆڕە.

(٤٧) وەبیر بهێنەرەوە ئەو کاتەی کە لەناو ئاگردا لەگەڵ یەکتردا دەمەقاڵەیانە، جا ژێردەستەو لاوازەکانی دنیا بەلوت بەرزان دەڵێن: بێگومان ئێمە پەیڕەوانی ئێوە بووین ئایا ئێوە دەتوانن لە جیاتی ئێمە بەشێك لەم ئاگرەی ئێمە لابەن؟ بەڵێ ئەمەیە داخوازی ئێوەی دواکەوتو، جا بزانن گەورەو سەرۆکەکانتان چیتان بۆ دەکەنو چۆنتان وەڵام دەدەنەوە.

(٤٨) ئەو کەسانەی کە خۆبەزلزان بوون دەڵێن: بێگومان هەمومان لەناو ئەم ئاگرەداین (کەس هیچی بۆ کەس پێ ناکرێت) بێگومان کە ﷲ بە دادگەرانە لەنێوان بەندەکانیدا بڕیاری داوەو تازە دۆزەخینو هیچ کارێك لە دەستمان نایەت، جا ئینجا هەموویان ڕوو لە دەرگاوانی دۆزەخ دەکەن کە بەڵکو بەزەیی پێیاندا بێتەوەو شتێکیان بۆ بکات.وەك دەفەرموێ:

(٤٩) جا ئەوانەی کە لەناو ئاگردان بە دەرگاوانی ئەو ئاگرە دەڵێن: لە پەروەردگارتان داوا بکەن بەڵکو ئەم سزایەمان ڕۆژێك لەسەر سوك بکات، داوای سوك بوونی ڕۆژێ سزا دەکەن، جا گوێ لە وەڵامی دەرگاوانی ئاگر بگرە ئەی مرۆڤی نەفام تاکەی بە هۆش نایەیتو هەتا کەی هەنگاوی کوێرانە دەنێیت تا دنیات لە دەست نەچوە زوو بگەڕێرەوەو بۆ هەمیشە خۆت لەو ئاگرە ڕزگار بکە.

(٥٠) ئەوانیش دەڵێن: ئایا پێغەمبەرانتان بە بەڵگەی ڕوونەوە نەهاتنە لاتانو ئەم ڕاستیانەیان بە ئێوە نەگەیاندوە؟ دەڵێن: بەڵێ هاتنە لامان. دەڵێن: دەی مادام وایە خۆتان داوا بکەن ئێمە نە گوێتان بۆ دەگرینو نە داوایشتان بۆ دەکەینو نەپێمان خۆشیشە ڕزگاربنو دڵنیایش بن کە وەڵامیشتان نادرێتەوەو سزایشتان لەسەر سوك ناکرێت و پاڕانەوەی خوانەناسان هەروا بەزایە دەچێت نەوەر دەگیرێتو نە وەڵام دەدرێتەوە.

(٥١) بێگومان ئێمە بەدەم نێرراوەکانی خۆمانەوەو ئەوانەش کە باوەڕیان هێناوە دێین لەم ژیانەی دنیاداو لەم ڕۆژەش کە شایەتەکان بۆ شایەتیدان ڕاست دەبنەوە لە ئەندامی لەشی خۆیانەوە بگرە تا فریشتەکانو پێغەمبەرانو پیاوچاکان.

(٥٢) ئەو ڕۆژەی کە ستەمکاران پاکانەکانیان سوودی نابێو بۆئەوان لەعنەت ونەفرین هەیە، وە بۆ ئەوان خراپترین ماڵ هەیە. جا قورئان پاشان دێتەوە سەر باسی موسا ﵇ و دەفەرموێ:

﴿٥٣﴾ جا بەراستی ئێمە ڕێنمونیمان دا بە موسا کە تەورات بو، ئەو پەڕاوەشمان بە کەلەپور دا بە نەوەی یەعقوب،

﴿٥٤﴾ بۆ ئەوەی ڕێنمایی‌و بیرەوەرییەك بێت بۆ خاوەن عەقلان.

﴿٥٥﴾ جا تۆش ئارامگرە بێگومان بەڵێنی ﷲ ڕاستەو دێتە جێ‌و داوای لێبوردن بکە بۆ تاوانەکانت بە ئێوارەو بە بەیانی لەگەڵ سوپاسی پەروەردگارتدا پاکی‌و بێ عەیبی ئەو بڵێ‌و نوێژی بۆ بکە تا خەڵکیش چاو لەتۆ بکەن.

﴿٥٦﴾ بەبێگومان ئەو کەسانەی کە لە بارەی نیشانەکانی (ﷲ)وە بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بۆ هاتبێ کێشەو دەمەقاڵە دەکەن ، جگە لە دەعیەو لوت بەرزی شتێکی تر لەناو دڵیاندا نیەو بەو ئاواتەش ناگەن، جا تۆ بە ﷲ پەنا بگرە لە شەڕو ئاشوبی ئەوان بێگومان ئەو هەر خۆیەتی بیسەری هەمو قسەو گفتوگۆیەکە و بینەری هەمو تەلاش و کردەوەیەکە.

﴿٥٧﴾ بێگومان دروستکردنی ئەم ئاسمانان‌و زەویە گەورەترە لە دروستکردنی خەڵك، بەڵام زۆربەی خەڵك ئەم شتە گرنگ‌و لەبەرچاوە نازانێت، ئینجا پەروەردگار بە نمونە باوەڕدارو بێباوەڕمان بۆ باسدەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٥٨﴾ چاوساغ و کوێر وەکو یەك نین‌و ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە وەکو خراپە کێڵ نین بێگومان ئەوانەی کە بیر دەکەنەوەو سود لە نیشانەکانی ﷲ وەردەگرن‌و لە کوێران خۆیان جیا دەکەنەوە کەمن.

﴿٥٩﴾ بێگومان قیامەت دێت کە هیچ گومانێکی تێدا نیە ، بەڵام زۆربەی خەڵك باوەڕ ناهێنن، ئەمەش بەدرۆ خەرەوەی قسەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن: دەبێت زۆربەی خەڵك باوەڕ بهێنن ئینجا بەرنامەی ئیسلام کاری پێبکرێت، جا با بیر بکەنەوە ئەگەر خاوەن ژیرییین.

﴿٦٠﴾ جا پەروەردگارتان دەفەرموێ: بانگم بکەن وەڵامتان دەدەمەوە، بەڕاستی ئەو کەسانەی کە خۆیان بە گەورە

قَالُوٓاْ أَوَلَمۡ تَكُ تَأۡتِيكُمۡ رُسُلُكُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ قَالُواْ بَلَىٰۚ قَالُواْ فَٱدۡعُواْۗ وَمَا دُعَٰٓؤُاْ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ ﴿٥٠﴾ إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَيَوۡمَ يَقُومُ ٱلۡأَشۡهَٰدُ ﴿٥١﴾ يَوۡمَ لَا يَنفَعُ ٱلظَّٰلِمِينَ مَعۡذِرَتُهُمۡۖ وَلَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ﴿٥٢﴾ وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَى ٱلۡهُدَىٰ وَأَوۡرَثۡنَا بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱلۡكِتَٰبَ ﴿٥٣﴾ هُدٗى وَذِكۡرَىٰ لِأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٥٤﴾ فَٱصۡبِرۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ بِٱلۡعَشِيِّ وَٱلۡإِبۡكَٰرِ ﴿٥٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡ إِن فِي صُدُورِهِمۡ إِلَّا كِبۡرٞ مَّا هُم بِبَٰلِغِيهِۚ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿٥٦﴾ لَخَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ أَكۡبَرُ مِنۡ خَلۡقِ ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٥٧﴾ وَمَا يَسۡتَوِي ٱلۡأَعۡمَىٰ وَٱلۡبَصِيرُ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَلَا ٱلۡمُسِيٓءُۚ قَلِيلٗا مَّا تَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾

دەگرن لە پاڕانەوەو بەندایەتی ئێمە، بەم زوانە سەرشۆڕانە دەخرێنە ناو دۆزەخەوە.

پێویستە بزانین کە وەڵامدانەوەی ﷲ بۆ ئێمە چەند مەرجی هەیە یەکێك لەوانە ئەوەیە کە ئێمەش بە گوێی ئەو بکەین.لەفەرمودەدا هاتوەکە{إِنَّ الدُّعاءَ هُوَ العِبادةُ/ابوداود وصححه الالباني/ بێگومان پاڕانەوە هەر خۆی بەندایەتیە}

﴿٦١﴾ (ﷲ)ئەو زاتەیە کە شەوی داناوە بۆ ئەوەی تێیدا بحەسێنەوەو ڕۆژیشی کردووە بە ڕوناك کەرەوە تا ئیش‌و کاری تێدا ئەنجام بدەن، بێگومانﷲ چاکەی زۆری هەیە بەسەر خەڵکەوە ، بەڵام زۆربەی خەڵك سپڵەو نمەك نەناسن‌و سوپاسی ئەو زاتە ناکەن.

﴿٦٢﴾ ئەوە (ﷲ) یە کە پەروەردگاری ئێوەیەو دروستکەری هەمو شتێکیشەو جگە لەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە، دەی بۆ ئێوە دەخەڵەتێن‌و لەڕێگای ئەو لادەدرێن؟!

﴿٦٣﴾ جا هەروەکو چۆن ئەوان لەڕێگای ﷲ لادران هەر بەو شێوەش ئەو کەسانەی کە بە نیشانەکانی ﷲ باوەڕ ناهێنن لەڕێگای ڕاست لادەدرێن.

إِنَّ ٱلسَّاعَةَ لَأٓتِيَةٞ لَّا رَيۡبَ فِيهَا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٥٩﴾ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلَّيۡلَ لِتَسۡكُنُواْ فِيهِ وَٱلنَّهَارَ مُبۡصِرًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلنَّاسِ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَشۡكُرُونَ ﴿٦١﴾ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ فَأَنَّىٰ تُؤۡفَكُونَ ﴿٦٢﴾ كَذَٰلِكَ يُؤۡفَكُ ٱلَّذِينَ كَانُواْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ ﴿٦٣﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِي جَعَلَ لَكُمُ ٱلۡأَرۡضَ قَرَارٗا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءٗ وَصَوَّرَكُمۡ فَأَحۡسَنَ صُوَرَكُمۡ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡۖ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾ هُوَ ٱلۡحَيُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۗ ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾ ۞ قُلۡ إِنِّي نُهِيتُ أَنۡ أَعۡبُدَ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَمَّا جَآءَنِيَ ٱلۡبَيِّنَٰتُ مِن رَّبِّي وَأُمِرۡتُ أَنۡ أُسۡلِمَ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦٦﴾

واتە مرۆڤ خۆی دەبێ سووربێ لەسەر گرتنی ڕێگای ڕاست ئەگینا لادەدرێتو ڕێگای ڕاستی لێ ون دەبێتوخۆشبەختی هەتا هەتایی لەدەست دەدات.

(٦٤) ﷲ ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ کردون بە ئارامگاو ئاسمانی بۆ کردون بە بان ، ئەوسا بە جوانترین شێوە وێنەی کێشاونو لەو شتانەش کە پاکە ڕۆزی پێداون، ئەو زاتەی کە ئەم شتانەی بۆ کردون (ﷲ)یە کە پەروەردگارتانە، ئای چەند پاکو بێ عەیبەو خاوەنی خێری زۆرە پەروەردگاری جیهانیان.

(٦٥) هەر خۆیەتی زیندوو هەمو زیندوەکانی تریش بە فەرمانی ئەو زیندوون وجگە لەویش پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە ، دەسا بیپەرستنو ئایینتان هەر بۆ ئەو پاک بکەنەوە، تەواوی سوپاس هەر شایستەی زاتی(ﷲ)یە کە پەروەردگاری جیهانیان.

(٦٦) بڵێ کاتێك کە من لەلایەن پەروەردگارمەوە بەڵگەی ڕۆشنم بۆ هات ئیتر بەرگری کرام لەوەی کە بەندایەتی بکەم بۆ ئەوانەی کە ئێوە جگە لە ﷲ بەندایەتی بۆ دەکەن، سەرەڕای ئەوەش فەرمانم پێکراوە کە بۆ پەروەردگاری جیهانیان گەردنکەچ بکەم چونکە جگە لەو پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە.

(٦٧) خۆی ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە خاكو پاشان لە دڵۆپە ئاوێكو پاشان لە خوێنێکی ڕەشی مەیو دروستی کردون ، ئینجا کردونی بە منداڵو لە ڕەحمی دایکەوە هێناونیە دەر پاشان ماوەتان دەدات تا ئەگەن بە هێزو توانایی‌و پاشان پیردەبنو بەر لەوە هەندێکتان دەمرێنرێن و هەندێکتان ماوە پێدەدرێن تا دەگات بەو ماوەی کە بۆی دانراوەو بەو هیوایە لە خۆتان بیر بکەنەوە، بیر لەو هەمو خولانەی کە بەسەرتان هاتوەو هیچیشی بەدەست خۆتان نەبوە ، سا بەڵکو بێنەوە سەرهۆشو لەو خوا نەناسی‌و سەرە ڕەویتانە دەست بکێشنەوە.

(٦٨) کەخوا ئەو زاتەیە کە دەژێنێتو دەمرێنێت هەر کاتێك شتێکی بوێت هەرکە پێی وت: ببە دەبێتو ڕێگری‌و بەرپەرچدەرەوەیەکی نیە.

(٦٩) ئایا تەماشای ئەو کەسانە ناکەیت کە لەبارەی نیشانەکانی (ﷲ)وە کێشە دەکەنو باوەڕی پێ ناهێنن، چۆن ئەوانە ئاوا لا دەدرێن لە باوەڕهێنان بەم قورئانە!

(٧٠) ئەو کەسانەی کە بەم قورئانەو بەوەی کە ڕەوانەمان کردوەتە لای تەواوی پێغەمبەران کە یەکخواپەرستیە بێ باوەڕبون ، ئەوسا ئەوانە بەم زوانە دەزانن چییان کردوە.

(٧١) ئەو کاتەی کە زنجیر ئاڵا لە ملیان و پێون کرانو ڕاکێشران.

هُوَ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ
يُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓا۟ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُوا۟
شُيُوخًا ۚ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ مِن قَبْلُ ۖ وَلِتَبْلُغُوٓا۟ أَجَلًا مُّسَمًّى
وَلَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ هُوَ ٱلَّذِى يُحْىِۦ وَيُمِيتُ ۖ فَإِذَا
قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٦٨﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ
يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ أَنَّىٰ يُصْرَفُونَ ﴿٦٩﴾ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟
بِٱلْكِتَٰبِ وَبِمَآ أَرْسَلْنَا بِهِۦ رُسُلَنَا ۖ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ
﴿٧٠﴾ إِذِ ٱلْأَغْلَٰلُ فِىٓ أَعْنَٰقِهِمْ وَٱلسَّلَٰسِلُ يُسْحَبُونَ ﴿٧١﴾
فِى ٱلْحَمِيمِ ثُمَّ فِى ٱلنَّارِ يُسْجَرُونَ ﴿٧٢﴾ ثُمَّ قِيلَ لَهُمْ أَيْنَ
مَا كُنتُمْ تُشْرِكُونَ ﴿٧٣﴾ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالُوا۟ ضَلُّوا۟ عَنَّا بَل لَّمْ
نَكُن نَّدْعُوا۟ مِن قَبْلُ شَيْـًٔا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٧٤﴾
ذَٰلِكُم بِمَا كُنتُمْ تَفْرَحُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَبِمَا كُنتُمْ
تَمْرَحُونَ ﴿٧٥﴾ ٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَبِئْسَ
مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٦﴾ فَٱصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ ۚ فَإِمَّا
نُرِيَنَّكَ بَعْضَ ٱلَّذِى نَعِدُهُمْ أَوْ نَتَوَفَّيَنَّكَ فَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٧٧﴾

﴿٧٢﴾ بەناو ئاوی داخدا پاشان خرانە ناو ئاگرو هەلگیرسێنران.

﴿٧٣﴾ پاشان پێیان وێژرا لە کوێن ئەوانەی کە ئێوە دەتان کردن بە شەریكو بەندایەتیان بۆ دەکردن؟

﴿٧٤﴾ جگە لە ﷲ دەڵێن: ئەوانەمان لێ ون بوون،جا هەر زوو لەوقسەیەش پەشیمان دەبنەوەو دەڵێن: نەخێر ئێمە لەپێشدا هیچ شتێکمان نەپەرستووە هەر ئاوەها چۆن لە دنیادا سەریان لێ تێکچووەو بە جوانی (ﷲ)یان نەناسیوە هەرئاوایش ﷲ خوانەناسان سەر لێتێك دەداتو نازانن لەو ڕۆژەدا چی بڵێن وچی بکەن. ئەی عاقڵ بیربکەرەوە پێش ئەوەی کە بەورۆژە بگەییتو کەس بەهاناتەوەنەیەت. وتراوە"هەڵە لەهەرکوێیدا لێی بگەڕێیتەوە قازانجە".

﴿٧٥﴾ ئەوەش لەبەرئەوەیە کە ئێوە بە ناحەق لەسەرئەم زەویدا بەدەعیەو فیزەوە خۆتان دەنواندو بە لوت بەرزیو سەیرو سەماوە سەرگەرم بون، جا پێتان دەوترێت:

﴿٧٦﴾ لە دەرگایانی دۆزەخەوە بچنە ژوورەوە کە هەمیشە تێیدا دەبن، جا چەند پیسە ئارامگاو جێگای خۆ بەزلزانان.

﴿٧٧﴾ سا تۆ ئارام بگرە لەسەر ئەو ئێشو ئازارانەی کە لەسەر ئەم بانگەوازە دوچارت هاتووەدێت، بێگومان بەڵێنی خوا کە سەرکەوتنی ڕاستیە، دێتەدی جا ئەگەر هەندێ لەوەی کە بەڵێنمان پێداون پیشانت بدەین یان تۆ بمرێنین وهیچ لەوبەڵێنانە نەبینی خۆئەوان هەر بۆ لای ئێمە دەهێنرێنەوە بۆ لێپرسینەوە ، واتە: ئەوانە هەر بە تۆڵەی خراپەی خۆیان ئەگەن چ لە زەمانی تۆ دابێت یان پاش مەرگی تۆ، هەر دەبێ بێنەوە بەر دەستمانو ناتوانن لەدەست تۆڵەوسزای ئێمەڕابکەن.

﴿٧٨﴾ بەراستی پێغەمبەرانێکی زۆرمان پێش تۆ ڕەوانە کردوە لەوانە هەندێکیانمان بۆ باس کردویتو هەندێکی ترمان بۆ باس نەکردویت، وە بۆ هیچ پێغەمبەرێکیش نیە کە بە بێ ماوە پێدان لەلایەن (ﷲ) وە هیچ نیشانەیەك بهێنێ ، جا هەر کاتێك فەرمانی ﷲ بۆ سزادانیان هات بەدادگەرانەو ڕاست کار جێ بەجێ دەکرێتو سزاو تاوانی خۆیان وەردەگرن ، جا ئا لەو کاتەدا ڕەنجەڕۆو شەرمەندەن بێهودەکاران.

لە قورئاندا ناوی بیستو پێنج پێغەمبەر هاتوە کە ئەمانەن:

"آدم ، إدريس ، نوح ، هود ، صالح ، إبراهيم ، لوط ، إسماعيل ، إسحاق ، يعقوب ، يوسف ، أيوب ، شعيب ، موسى ، هارون ، يونس ، داود ، سليمان ، إلياس ، اْليَسَع ، زكريا ، يحيى ، عيسى" وە هەروەها "ذو الكفل " لای زورێك لە راڤەکاران وە دوایین پێغەمبەریش کە سەروەری هەموویانە "محمد ﷺ"

بەڵام لای زۆربەی زانایان ئەو فەرمودانەی کە باسی ژمارەی هەمو پێغەمبەران دەکەن لاوازن وە پێیان وایە هەروەك ئایەتەکە فەرموی" هەندێکی ترمان بۆ باس نەکردویت "

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِّن قَبْلِكَ مِنْهُم مَّن قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُم مَّن لَّمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ ۗ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَن يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ ۚ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْمُبْطِلُونَ ﴿٧٨﴾ اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَنْعَامَ لِتَرْكَبُوا مِنْهَا وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٩﴾ وَلَكُمْ فِيهَا مَنَافِعُ وَلِتَبْلُغُوا عَلَيْهَا حَاجَةً فِي صُدُورِكُمْ وَعَلَيْهَا وَعَلَى الْفُلْكِ تُحْمَلُونَ ﴿٨٠﴾ وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ فَأَيَّ آيَاتِ اللَّهِ تُنكِرُونَ ﴿٨١﴾ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَكْثَرَ مِنْهُمْ وَأَشَدَّ قُوَّةً وَآثَارًا فِي الْأَرْضِ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَمَّا جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرِحُوا بِمَا عِندَهُم مِّنَ الْعِلْمِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴿٨٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا قَالُوا آمَنَّا بِاللَّهِ وَحْدَهُ وَكَفَرْنَا بِمَا كُنَّا بِهِ مُشْرِكِينَ ﴿٨٤﴾ فَلَمْ يَكُ يَنفَعُهُمْ إِيمَانُهُمْ لَمَّا رَأَوْا بَأْسَنَا ۖ سُنَّتَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ فِي عِبَادِهِ ۖ وَخَسِرَ هُنَالِكَ الْكَافِرُونَ ﴿٨٥﴾

پێغەمبەریش لە ژماری هەموو پێغەمبەران ئاگادار نەوبوە.

والله اعلم.

ئینجا پەروەردگار پاش باسی نیعمەتی هیدایەتو رەوانەکردنی پێغەمبەران هەندێ لەو چاکانەی خۆی بۆ بەندەکانی باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٧٩) ﷲ ئەو زاتەیە کە چوار پێیانی دروستکردوە بۆتان تا سوارای هەندێکیان ببن لەهاتوچۆداو گۆشتی هەندێکیان بخۆن.

(٨٠) خۆ لەواندا زۆر سودی ترتان دەست دەکەوێت وەکو شیرو ماستو کەرەو خوریو موو و کورک کە هەندێکیان بۆ خواردنو هەندێکیان بۆ پۆشاك تا بەهۆی ئەوانەوە بگەن بەئامانجەکانی ناو دەرونتان، هەرئاوەها ئێوە لەسەر کەشتیو لەسەر ئەوان هەڵدەگیرێنو ئازو گویازتان پێدەکرێت بۆ بژێویو خۆشیو سەیران.

(٨١) جا نیشانەکانی خۆیتان پیشان دەدات لەم بونەوەرەو لە خودی خۆتاندا ، سا ئێوە حاشا لە کام نیشانەکانی ﷲ دەکەن و کامتان بەلاوە راست نیە؟

(٨٢) ئایا ئەوان بەم زەویەدا نەگەڕاون جا تەماشا بکەن کە سەر ئەنجامی ئەو کەسانەی کە لەپێش ئەوانەوە بوەو لەوانیش زۆرترو بەهێزتربوون لەسەر ئەم زەویدا چیان بەسەرهات لەسەر خوانەناسیو دژایەتیان بۆ ئایینو پێغەمبەرەکەیان؟ ئەوسا ئەوەی کە پەیدایان کرد بو لە سەروەتو سامان ومنداڵو هێزو دەسەڵاتی زۆر هیچ سودی پێنەدان، جا پێویستە ئەم گەلەش بیر بکەنەوەو لە دژایەتی ئایینو پێغەمبەرﷺ دەست بکێشنەوەو لەپێشوان پەند وەرگرن ئەگەر ژیر بن.

(٨٣) جا کاتێك کە پێغەمبەرەکانیان (درودی خوایان لێبێ) بە نیشانە گەلی ڕوونەوە هاتنە لایان ئەوان بەو زانینەی خۆیان هەیان بو دەیان نازیو گاڵتەیان بە پێغەمبەران دەکردو گوێیان پێنەدان ، جا تۆڵەی ئەو گوێ پێنەدانو گاڵتە کردنە یەخەی گرتنودوچاری سزابون.

(٨٤) جا کاتێك کە سزای ئێمەیان دی وتیان: باوەڕمان هێناوە بە تاكو تەنیایی (ﷲ)و باوەڕمان نیە بەوەی کە کردومانن بە هاوبەشی ﷲ ، بەڵێ ئەمە کاتی لێ قەومانەو تازە ئەم پەشیمان بوونەوەیە بێسودە بۆیە دەفەرموێ:

(٨٥) جا ئەو باوەڕ هێنانەیان لە کاتێکدا کە سزای ئێمە دەبینن هیچ سودیان پێنادادتو ئەو باوەڕە وەرناگیرێت ئەمە دابو نەریتی (ﷲ)یە کە لەناو بەندەکانیدا تێپەڕیوە، بەراستی لەو کاتەدا خوانەناسان ڕەنجەڕۆو زەرەرمەندن، لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبیتەوە کە ﷲ تەوبەی ئەو کەسانە وەرناگرێت کە تاوان دەکەن تا سزا یەخەیان دەگرێت جا دەزانن ڕزگار نابن ئەوکاتە دان بە تاوانی خۆیاندا دەنێنو لە کاروکرداری پێشوی خۆیان پەشیمانن.

## ٤١ سورەتی فوسیلەت ٥٤

سورەتی فوسیلەت کە سورەتی چلو یەکەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتۆتە خوارەوە، پەنجاو چوار ئایەتەو سورەتی (حم السجدة)و سورەتی (المصابیح)یشی پێدەوترێت. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستو یەکەمەو پاش سورەتی (غافر) و پێش (الزخرف) دابەزیوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١) حامیم. هەر اللّٰه خۆی مەبەستی ئەم پیتە جیاجیایانەی سەرەتای ئەم سورەتانەی قورئان دەزانێت، وە ئەمەش ڕاسترین بۆچونە لە بارەی ئەو پیتانەوە.

(٢) ئەم قورئانە لەلایەن زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبانەوە دابەزیوە، لەبەر ئەوە دەبێت باوەڕمان هەبێت کە بڕیارو یاساکانی هەموی مایەی خێرو خۆشی مرۆڤە چونکە دانراوی زاتێکی بەسۆزو میهرەبانە.

(٣) ئەمە پەڕاوێکە کە نیشانەکانی جیا کراوەتەوەو ڕۆشنە، خوێنراوەیەکی عەرەبیە بۆ گەلێك کە بزانن. واتە ئەم ڕۆشنیە کەسێك دەیزانێت کە زانیاری قوڵو چاکی هەبێت وخۆی گێل نەکات.

(٤) موژدەدەرە بە ڕەزامەندی (اللّٰه)و بە بەهەشتی هەتاهەتایی بەو کەسانەی کەباوەڕی پێسدەکەنو ترسێنەرە بۆ ئەو کەسانەش کە باوەڕی پێناکەن، ئەوسا زۆربەی ئەوان پشت لە ڕاستی دەکەن جا هەروەکو کەڕ ئەوان قسەی ڕاستو چاك نابیسن.

(٥) جا ئەوان وتیان: دڵمان لەناو چەندین بەرگدایەو لەبارەی ئەوەی کە تۆ بانگمان دەکەیت بۆ لایو تێناگەینو وەری ناگرینو باری گران لەناو گوێچکەکانمان دایەو کەڕینو هیچ نابیسینو لەنێوان ئێمەو تۆدا پەردە هەیە، جا تۆ چی دەکەیت بۆ خۆت بیکە، ئێمەش ئەوەی کە دەمانەوێت دەیکەین "دینی خۆت بۆ خۆتو دینی خۆمان بۆ خۆمان".

(٤) ئەی محمدﷺ بڵێ: من هەر مرۆڤێکم وەکو ئێوە، پەیامم بۆ هاتوە کە پەرستراوی ڕاستەقینەی ئێوە هەر پەرستراوێکی تەنهایە، جا بە بەردەوامی ڕوی تێبکەنو داوای لێبوردنی لێ بکەن، وای بۆ موشریکان کە اللّٰه بە تەنیا ناناسن (موشریك بەو کەسە دەوترێت کە باوەڕی بە اللّٰه ببێو بە خالقو ڕازیقی خۆی بزانێ بەڵام پەیڕەوی جگە لەویش بکات چ بت بێت یان مرۆڤ یان ئارەزۆ یان پلەو پایە بە شێوەیەك لەگەل بڕیاری (اللّٰه)دا یەك نەکەونو پێی وابێ لەم بەشانەدا دەبێت دابو نەریتو

## ٤١ سُورَةُ فُصِّلَتْ ٥٤

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلٞ مِّنَ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٢﴾ كِتَٰبٞ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ﴿٣﴾ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا فَأَعۡرَضَ أَكۡثَرُهُمۡ فَهُمۡ لَا يَسۡمَعُونَ ﴿٤﴾ وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِيٓ أَكِنَّةٖ مِّمَّا تَدۡعُونَآ إِلَيۡهِ وَفِيٓ ءَاذَانِنَا وَقۡرٞ وَمِنۢ بَيۡنِنَا وَبَيۡنِكَ حِجَابٞ فَٱعۡمَلۡ إِنَّنَا عَٰمِلُونَ ﴿٥﴾ قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ ﴿٦﴾ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ ﴿٧﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ ﴿٨﴾ ۞ قُلۡ أَئِنَّكُمۡ لَتَكۡفُرُونَ بِٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡأَرۡضَ فِي يَوۡمَيۡنِ وَتَجۡعَلُونَ لَهُۥٓ أَندَادٗاۚ ذَٰلِكَ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٩﴾ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِيَ مِن فَوۡقِهَا وَبَٰرَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَآ أَقۡوَٰتَهَا فِيٓ أَرۡبَعَةِ أَيَّامٖ سَوَآءٗ لِّلسَّآئِلِينَ ﴿١٠﴾ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰٓ إِلَى ٱلسَّمَآءِ وَهِيَ دُخَانٞ فَقَالَ لَهَا وَلِلۡأَرۡضِ ٱئۡتِيَا طَوۡعًا أَوۡ كَرۡهٗا قَالَتَآ أَتَيۡنَا طَآئِعِينَ ﴿١١﴾

واقیعو بەرژەوەندی و...هتد پەیڕەو بکرێت، ئەم جۆرە کەسانە دوچاری گوناهێکبوون کە بە تەوبە نەبێت اللّٰه چاوپۆشیان لێ ناکاتو هەرکردارو گوفتارو بەرنامەیەکی تری چاکیشیان ئەنجام دابێتو ئەنجام بدەن هەڵوەشاوەیەو هیچ پاداشتێکیان دەست ناکەوێت، هەروەك دەفەرموێ: ﴿ئەی باوەڕداران پەیڕەوی خواو پەیڕەوی پێغەمبەر بکەنو کرداری خۆتان هەڵمەوەشێننەوە﴾ محمد:٣٣.

(٧) موشریك ئەو کەسانەن کەزەکات نادەن و ئەوانە هەر بێ باوەڕیشن بە ڕۆژی دوایی، یان هەرکاتێك زەکات پێویست بکرێت لەسەریان نایدەن.

ئەم ئایەتە لە مەکەدا هاتوەو لەو کاتەدا زەکات واجب نەبوە بەڵکو لەساڵی دووهەمی کۆچیدا زەکات واجب بوە، لەسەر لێکدانەوەی دوایی دەگونجێت وەکو هەواڵێکی شاراوە بێت و اللّٰه دەزانێ کە ئەم موشریکانە لەپاشدا زەکاتیش نادەن. هەروەها وریا کردنەوەی ئەو باوڕدارانەی ئەو سەردەمە بووە کە خۆیان ئامادە بکەن بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکەش هەر کات فەرزکرا وە هەندێ وتویانە مەبەست لە زەکات مانای زاراوەییەکەیتی واتە موشریك ئەو کەسانن کە خۆیان بە یەکتاپەرەستی لە پیسی وچەپەڵی شیرك خاوێن ناکەنەوە.

فَقَضَىٰهُنَّ سَبۡعَ سَمَٰوَاتٖ فِي يَوۡمَيۡنِ وَأَوۡحَىٰ فِي كُلِّ سَمَآءٍ أَمۡرَهَاۚ وَزَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَحِفۡظٗاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ﴿١٢﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَقُلۡ أَنذَرۡتُكُمۡ صَٰعِقَةٗ مِّثۡلَ صَٰعِقَةِ عَادٖ وَثَمُودَ ﴿١٣﴾ إِذۡ جَآءَتۡهُمُ ٱلرُّسُلُ مِنۢ بَيۡنِ أَيۡدِيهِمۡ وَمِنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَۖ قَالُواْ لَوۡ شَآءَ رَبُّنَا لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةٗ فَإِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿١٤﴾ فَأَمَّا عَادٞ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ﴿١٥﴾ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِيٓ أَيَّامٖ نَّحِسَاتٖ لِّنُذِيقَهُمۡ عَذَابَ ٱلۡخِزۡيِ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَعَذَابُ ٱلۡأٓخِرَةِ أَخۡزَىٰۖ وَهُمۡ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٦﴾ وَأَمَّا ثَمُودُ فَهَدَيۡنَٰهُمۡ فَٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡعَمَىٰ عَلَى ٱلۡهُدَىٰ فَأَخَذَتۡهُمۡ صَٰعِقَةُ ٱلۡعَذَابِ ٱلۡهُونِ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿١٧﴾ وَنَجَّيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَكَانُواْ يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾ وَيَوۡمَ يُحۡشَرُ أَعۡدَآءُ ٱللَّهِ إِلَى ٱلنَّارِ فَهُمۡ يُوزَعُونَ ﴿١٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا مَا جَآءُوهَا شَهِدَ عَلَيۡهِمۡ سَمۡعُهُمۡ وَأَبۡصَٰرُهُمۡ وَجُلُودُهُم بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢٠﴾

﴿٨﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناو کرداری چاکیان کرد پاداشتێکی نەبڕاوەیان بۆ هەیە کە بەهەشتی هەتاهەتایی‌و نازو نیعمەتەکانیەتی.

﴿٩﴾ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بەو زاتەی کە لە دوو ڕۆژدا ئەم زەوییەی دروستکردوە باوەڕ ناکەن‌و هاوتای بۆ دادەنێن؟ کە ئەوە پەروەردگاری جیهانیانە بە گەروەو بچوك‌و بە گیاندارو بێگیانیەوە.

﴿١٠﴾ جا لەناودڵی ئەم زەوییەدا چیا گەلێکی گەورەو بچوك‌و بەرزو نزم کە لەسەریەوە دەرکەوتوە دروستکردوە تا وەك مێخێك زەوی ڕابگرێت و فەڕو پیتی لەناویدا داناوەو لەماوەی چوار ڕۆژی تەواودا کەرەسەی ئەوەی کە بۆ ژیان لەم زەوییەدا پێویست بێت تێیدا دانا ، یان ئەم پێویستیەکە دایناوە لەناویدا یەکسانە بۆ نیازمەندان.

﴿١١﴾ پاش دروستکردنی زەوی‌و کەرەسە پێویستیەکانی بڕیاری ﷲ بۆ دروستکردنی ئاسمان دەرچو لە حاڵێکدا کە دووکەڵ بون، جا بە ئاسمانان‌و زەوی فەرمو: وەرن، پێتان خۆش بێت یان پێتان ناخۆش بێت ئەوانیش وتیان: بە خۆشی خۆمان هاتین‌و ئامادەی گوێ ڕایەڵین بۆ هەمو فەرمانەکانت.

﴿١٢﴾ ئەوسا حەوت ئاسمانی تەواوکرد لە دوو ڕۆژدا کە ڕۆژی پێنج شەممەو جومعەبوە، وە هەر ئاسمانێکیش چی پێویست بوە لە بەرنامە و ئیش تێدا کردن‌و چەندو چۆنیەتی هەموی پێ گەیاندوەو ئاسمانی ئەم زەویەش کە ئێمە لەسەری دەژین بە ئەستێرەکان کە وەکو چرا ڕوناکی دەدەن‌و دەدرەوشێنەوە رازاندوەتەوەوکردونی بە پارێزگاری ئاسمانگ لە شەیتانەکان، ئەوەی کەباسکرا بە درێژی هەموی ئەندازەگیری ئەو دەسەڵاتدارو زانایە کە هیچی لێ ون نابێت.

﴿١٣﴾ جا ئەگەر پشتیان لەقسەکانت کردوگوێیان پێنەدایت ئەوسا بەوان بڵێ: دەتان ترسێنم بە دەنگێکی تۆقێنەر هەروەکو ئەودەنگە تۆقێنەرەی کە عادو سەمودی لەناوبرد.

﴿١٤﴾ ئەو کاتەی کە هەر گەلێك لە سەردەمی خۆیدا پێغەمبەریان بۆ ڕەوان دەكراو پێش ئەوانیش بۆ گەلانی تریش هاتبون هەمویان یەك دەنگبوون لەسەر ئەوەی کەجگە لە ﷲ کەسێکی تر مەپەرستن، بەڵام ئەوان لە وەڵامی پێغەمبەرەکانیاندا وتیان: ئەگەر پەروەردگارمان ئارەزۆی لێبووایە فریشتەی دەنارد، جا ئێمە بەوەی کە ئێوەی بۆ ڕەوانە کراوە باوەڕمان نیەو دواتان ناکەوین.

﴿١٥﴾ خۆ هۆزی عاد بەناڕەوا خۆیان بە زلگرت لەم زەویەداو وتیان: کێ هەیە لە ئێمە بەهێزترە؟ ئایا نابینن‌و نازانن کە بێگومان ئەو(ﷲ) یەی کە ئەوانی دروستکردوە ئەو لەوان گەلێك بەهێزترە، جا ئەوان بە نیشانەکانی ئێمە باوەڕ ناکەن‌و حاشای لێدەکەن.

﴿١٦﴾ ئەوسا ئێمەش بایەکی ساردی بە نرکەو ناڵەمان ڕەوانەکرد بۆیان لەچەند ڕۆژێکی نەگبەتدا کەحەوت شەو و هەشت ڕۆژبو بەبێ پسانەوە، تا لەم ژیانەی دنیادا سزای سەرشۆڕکەریان پێبچەژێن‌و پاشەڕۆژیش سزای لەوە بەهێزترو سەرشۆڕکەرتریان بۆ هەیەو ئەوان بۆ لابردنی ئەو سزایە لەلایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن تا لەسەریان لابرێت.

﴿١٧﴾ خۆ ئێمە گەلی سەمودیشمان بەرەو خۆمان ڕێنمونی کرد بەڵام ئەوان گومڕاهیان هەڵبژارد لەباتی ڕێگای ڕاست ئەوسا دەنگی سزایەکی سەرشۆڕکەر گرتنی ئەوەش بەهۆی ئەو کەسب‌و کارە ناشرینانەی خۆیان بو، واتە پەروەردگار ستەمی لێ نەکردون.

﴿١٨﴾ جا ئەوانەیان کە باوەڕیان هێنابوو خۆیشیان لەو کارانە پاراستبوو کە ڕقمان لێیان هەستێت ڕزگارمان کردن‌و هیچ بێتاوانێکمان وەبەر سزا نەخست.

وَقَالُواْ لِجُلُودِهِمْ لِمَ شَهِدتُّمْ عَلَيْنَا قَالُوٓاْ أَنطَقَنَا ٱللَّهُ ٱلَّذِىٓ أَنطَقَ كُلَّ شَىْءٍ وَهُوَ خَلَقَكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٢١﴾ وَمَا كُنتُمْ تَسْتَتِرُونَ أَن يَشْهَدَ عَلَيْكُمْ سَمْعُكُمْ وَلَآ أَبْصَٰرُكُمْ وَلَا جُلُودُكُمْ وَلَٰكِن ظَنَنتُمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَا يَعْلَمُ كَثِيرًا مِّمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٢٢﴾ وَذَٰلِكُمْ ظَنُّكُمُ ٱلَّذِى ظَنَنتُم بِرَبِّكُمْ أَرْدَىٰكُمْ فَأَصْبَحْتُم مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن يَصْبِرُواْ فَٱلنَّارُ مَثْوًى لَّهُمْ وَإِن يَسْتَعْتِبُواْ فَمَا هُم مِّنَ ٱلْمُعْتَبِينَ ﴿٢٤﴾ وَقَيَّضْنَا لَهُمْ قُرَنَآءَ فَزَيَّنُواْ لَهُم مَّا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْقَوْلُ فِىٓ أُمَمٍ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِم مِّنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنَّهُمْ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٢٥﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسْمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَٱلْغَوْاْ فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَغْلِبُونَ ﴿٢٦﴾ فَلَنُذِيقَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَذَابًا شَدِيدًا وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَسْوَأَ ٱلَّذِى كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآءُ أَعْدَآءِ ٱللَّهِ ٱلنَّارُ لَهُمْ فِيهَا دَارُ ٱلْخُلْدِ جَزَآءًۢ بِمَا كَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿٢٨﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ رَبَّنَآ أَرِنَا ٱلَّذَيْنِ أَضَلَّانَا مِنَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ نَجْعَلْهُمَا تَحْتَ أَقْدَامِنَا لِيَكُونَا مِنَ ٱلْأَسْفَلِينَ ﴿٢٩﴾

﴿١٩﴾ وەبیریان بهێنەرەوە ئەو ڕۆژەی کە دوژمنانی ﷲ بەرەو ئاگر کۆ دەکرێنەوە جا ئەوسا دەستە دەستە پاڵ دەنرێن.

﴿٢٠﴾ تا ئەو کاتەی کە دەگەن بەو ئاگرە، ئینجا هەر کارێکیان کردوە گوێچکەیانو چاویانو لەشیان شایەتیان لەسەر دەدەنو هیچیان بۆ داناپۆشرێت.

﴿٢١﴾ جا بە گلەییو شەرمەزارییەوە بە لەشیان دەڵێن: بۆچی شایەتیتان لەدژمان دا؟ ئەوانیش لە وەڵامیاندا دەڵێن: ﷲ ئێمەی هێنایە قسەکردن، ئەو زاتەی کە هەمو شتێك دێنێتە قسەکردنو هەر خۆیەتی یەکەم جار دروستیکردونو هەر بۆ لای ئەویش دەهێنرێنەوە.

﴿٢٢﴾ خۆ ئێوە لەوەی کە شایەتی بدات لێتان کە گوێچکەتانو چاوتانو پێستانە هیچتان نەدەشاردەوە، چونکە باوەڕتان بە زیندوبونەوە نەبو بەڵکو گومانتان وابو کە ﷲ بە زۆرێك لەو شتانەی کە ئێوە دەیکەن بێ ئاگایە. لە چەند ڕێگایەکەوە کە هەندێکیان جوانە(حسن) هاتوە کە دەڵێت: تاقمێك لە نەیارانی پێغەمبەرمانﷺ هەندێکیان بە هەندێکیان وت: ئایا ﷲ هەمو قسەیەکی ئێمە دەبیسێت؟ هەندێکیان وتیان: ئەگەر دەنگمان بەرز نەکەینەوە نایبیسێت، هەندێکی تریان وتیان: ئەگەر شتێك ببیسێت هەموی دەبیسێت ئائەم قسەیە باسکرا بۆ پێغەمبەر ﷺ جا ﷲ ئەم ئایەتەی دابەزاندو تێیگەیاندن کە ئەگەر بەناو دڵێشیاندا بێت هەر دەیزانێو شایەتی لەسەر دەدات خۆ ئەوەی ناو دڵیش هەر ﷲ خۆی دروستی دەکات ﴿دەی ئایا دەگونجێت کەسێ شتێ دروست بکاتو پێی نەزانێ لەحاڵێکدا کەزۆر وردبینو بەئاگایە؟﴾مولك/١٤.

﴿٢٣﴾بەڵێ ئەو گومانە ناڕەواتانە بو کە واتان گومان دەکرد کە پەروەردگارتان بەکارو کۆششتان نازانێت جا ئەو بۆچونە هەڵەیە لەناوی بردن، ئەوسا چونە ڕیزی ڕەنجەڕۆیانەوە.

﴿٢٤﴾ جا ئیتر ئەگەر خۆیان بگرن ئەوسا هەر ئاگر جێگایانەو ئەگەر داوای لێبوردنیش بکەن، ئەوسا ئەوان لەوانە نین کە لێبوردنیان لێوەردەگیرێت. واتە جگە لە ئاگری دۆزەخ باچاوەڕێی هیچی تر نەکەن.

﴿٢٥﴾ جا بەهۆی لاساری خۆیانەوە دۆستانی وامان بۆ پەیداکردن کە هەمو کارو کۆششێکی خراپی پێشو پاشی خۆیانی بۆ جوان کردن وبڕیاری(ﷲ)یش کە پڕکردنی دۆزەخە هاتەدی لەسەر ئەوانو چونە ڕیزی ئەو گەلە خراپانەی پێشخۆیانەوە لە جنۆکەو ئینسان، کەبێگومان ئەوان لە ڕەنجەڕۆیان بون.

﴿٢٦﴾ جا خوانەناسان بە یەکتریان وت: گوێ لەم قسانە مەگرنو هەر کاتێك ئەم قورئانە خوێنرایەوە قسەی بێسودو بێ کەڵکی خۆتانی تێکەڵ بکەن تاکو ئێوە سەرکەون بەسەریداو قسەی بڕنو نەیەڵن خەڵك لێی تێبگات.

﴿٢٧﴾ جا ئێمەش سزای توندمان پێچەژاندنو بێگومان بە خراپترین لەو کردارو ڕەفتارە پیسانەی کە کردویانە تۆڵەیان لێ وەردەگرین.

﴿٢٨﴾ ئەو تۆڵە خراپەی کە باسکرا بۆ دوژمنانی ﷲ، ئاگرەودۆزەخ کە هەر لەوێدا هەیە بۆ ئەوان لەناو ئەو ئاگرەدا ماڵی هەمیشەییان، جا ئەم تۆڵە خراپو سەختە بە هۆی ئەوەبو کە ئەوان دانیان بە نیشانەکانی ئێمەدا نەدەنا.

﴿٢٩﴾ جا ئەو کەسانەی کە خوانەناسن لە قیامەتدا دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەو دوانەی کە سەریان لەئێمە شێواندو گومڕایان کردین لە جنۆکەو لە مرۆڤ پیشانمان بدە تا ئێستا بۆ ئەوەی بێنرخ وسەرشۆڕیان بکەین، بیانخەینە ژێر پێی خۆمان وپێ پڕنەیان بکەین. بەڵێ، نەزانان لەوێ ئەو قسە گەورە یە دەکەنو لەدنیایشدا بەندەیانن وخۆیان فیدایان دەکەنو کەس وکارو ماڵو سامانیان لە ڕێگایاندا دادەنێن؟! ئای ئێمەی مرۆڤ چەندە نەزان وبێ شەرمین. ئینجا بە دوای باسی خراپاندا پەروەردگار باسی چاکان دەکاتو دەفەرموێ:

إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ﴿٣٠﴾ نَحۡنُ أَوۡلِيَآؤُكُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِۖ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَشۡتَهِيٓ أَنفُسُكُمۡ وَلَكُمۡ فِيهَا مَا تَدَّعُونَ ﴿٣١﴾ نُزُلٗا مِّنۡ غَفُورٖ رَّحِيمٖ ﴿٣٢﴾ وَمَنۡ أَحۡسَنُ قَوۡلٗا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا وَقَالَ إِنَّنِي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسۡتَوِي ٱلۡحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُۚ ٱدۡفَعۡ بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِي بَيۡنَكَ وَبَيۡنَهُۥ عَدَٰوَةٞ كَأَنَّهُۥ وَلِيٌّ حَمِيمٞ ﴿٣٤﴾ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ٱلَّذِينَ صَبَرُواْ وَمَا يُلَقَّىٰهَآ إِلَّا ذُو حَظٍّ عَظِيمٖ ﴿٣٥﴾ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيۡطَٰنِ نَزۡغٞ فَٱسۡتَعِذۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿٣٧﴾ فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ ۩ ﴿٣٨﴾

(٣٠) بەبێگومان ئەو کەسانەی کە دەڵێن: پەروەردگارمان (اللَّه) یەو پاشان لەسەر ئەم قسەیەی خۆیان لانادەن تا دەگەنە سەرە مەرگ ئا لەو کاتەدا فریشتەکان دادەبەزنە لایانو دڵخۆشیان دەکەنو دەڵێن: مەترسنو خەم مەخۆنو موژدە بدەن بەو بەهەشتەی کە بەڵێنتان پێدرابو.

(٣١) ئێمە دۆستانتانین لە ژیانی دنیاو لە ڕۆژی دوایشدا، خۆ بۆتان هەیە لەناو ئەو بەهەشتەدا ئەوەی کە نەفستان پێی خۆشەو هەرچی داوای بکەن لەناویدا دەستان دەکەوێت.

(٣٢) ئەمە میواندارییەکە لەلایەن زاتێکی لێبووردەو چاوپۆشی کەر لە تاوانو میهرەبانەوەکە (اللَّه) یە.

(٣٣) جا کێ هەیە قسەی جوانتر بێت لەو کەسەی کە بانگی خەڵك دەکات بەرەو (اللَّه)و کرداری چاك دەکاتو دەڵێت: بێگومان من لە موسڵمانانم؟

(٣٤) چاكو خراپ یەکسان نین جا با بەو ڕەوشت وئەخلاقەی کە جوانە پاڵ بنێ بە خراپەوە، ئەوسا ئەو کەسەی کە لەنێوان تۆو ئەودا دوژمنایەتی بوە هەروەکو دۆستێکی نزیك دەبێ بۆت.

(٣٥) خۆ ئاوا کارێك ناکەن وناگەن بەم پلەیە مەگەر ئەو کەسانەی کەخۆیان ڕاگرتوەو نەفسی خۆیان لەسەر لێبوردنو چاوپۆشی ڕامکردوە، دیسان ناگەن بەو پلەیە مەگەر خاوەنی بەشێکی گەورەبن.

(٣٦) جا هەر کاتێك لە شەیتانەوە دوچاری ختورەو خەیاڵێك بوی کە لە ڕەوشتی بەرزو جوان لات بدات، ئەوسا بەپەلە پەنا بەرە بۆ اللَّه بۆ ئەوەی لەو ختورەو خەیاڵە خراپە پاکت بکاتەوە کە بێگومان ئەو هەر خۆیەتی بیسەری هەمو قسەو ختورەی بەندەکانی و زانەری هەمو کردارێکی، ئینجااللَّه بەشێکی تر لەنیشانە گرنگەکانی خۆیمان بۆ باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٣٧) خۆ هەندێك لە نیشانەکانی بوونی(اللَّه)و هێزو دەسەڵاتو زانیاریو دانایی ئەو زاتە شەو و ڕۆژو خۆرو مانگە کە چۆنی دروستکردونو هەموویانی ڕامکردوە بۆ ئەنجامدانی ئەو شتانەی کە بەسودی مرۆڤن، جا نە سوجدە بۆ ڕۆژ ببەنو نە بۆ مانگ، ئەگەر ئێوە تەنها ئەو زاتە دەپەرستن سوجدە تەنها بۆ اللَّه ببەن ئەوەی کە ئەوانی دروستو ڕامکردوە.

(٣٨) ئەوسا ئەگەر ئەوان خۆیان بە زلگرتو بەندایەتی (اللَّه)یان نەکرد هەر خۆیان زیان لێکەوتو دەبن، چونکە ئەوانەی کە لە لای پەروەردگاری تۆن بە شەوو بە ڕۆژ تەسبیحاتی ئەو دەکەنو ئەوان هەرگیز بێ تاقەت نابن لە بەندایەتیو پەرستنی ئەو زاتەدا.

(٣٩) جا هەندێکی تر لە نیشانەی بوونو دەسەڵاتی ئەو زاتە ئەوەیە کە بێگومان تۆ ئەو زەویە دەبینی کە وشکو بێ هەستو خوستە، جا ئێمە بارانی بۆ دەبارێنین کە دەجوڵێتو بەرز دەبێتەوەو دانەوێڵەو ڕووەکی لێشین دەبیت، بێگومان ئەو کەسەی کە ئەو زەوییەی زیندوو کردەوە هەروا مردوانیش زیندوو دەکاتەوە، بێگومان ئەو توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە.

(٤٠) بێگومان ئەو کەسانەی کە نیشانەکانی ئێمە دەگۆڕن بە لادانی لە مانای خۆی بۆ مەبەستی تایبەتی خۆیان لە ئێمە ناشارێنەوەو سزایان دەدەین بە ئاگر، جا ئایا ئەو کەسەی کە فڕێ دەدرێتە ناو ئاگرەوە چاکە یان ئەو کەسەی کە لە ڕۆژی قیامەتا بە ئاسودەیی بەرەو سەرای مەحشەر دێت؟ دەی هەرچی ئارەزۆتان لێیەتی لە چاکەو خراپە بیکەن بێگومان ئەو زاتە بینەرە بەو شتەی کە دەیکەن.

وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنَّكَ تَرَى ٱلْأَرْضَ خَٰشِعَةً فَإِذَآ أَنزَلْنَا عَلَيْهَا ٱلْمَآءَ ٱهْتَزَّتْ وَرَبَتْ ۚ إِنَّ ٱلَّذِىٓ أَحْيَاهَا لَمُحْىِ ٱلْمَوْتَىٰٓ ۚ إِنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا لَا يَخْفَوْنَ عَلَيْنَآ ۗ أَفَمَن يُلْقَىٰ فِى ٱلنَّارِ خَيْرٌ أَم مَّن يَأْتِىٓ ءَامِنًا يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ ٱعْمَلُوا۟ مَا شِئْتُمْ ۖ إِنَّهُۥ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلذِّكْرِ لَمَّا جَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ مَّا يُقَالُ لَكَ إِلَّا مَا قَدْ قِيلَ لِلرُّسُلِ مِن قَبْلِكَ ۚ إِنَّ رَبَّكَ لَذُو مَغْفِرَةٍ وَذُو عِقَابٍ أَلِيمٍ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ جَعَلْنَٰهُ قُرْءَانًا أَعْجَمِيًّا لَّقَالُوا۟ لَوْلَا فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥٓ ۖ ءَا۬عْجَمِىٌّ وَعَرَبِىٌّ ۗ قُلْ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ هُدًى وَشِفَآءٌ ۖ وَٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ فِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرٌ وَهُوَ عَلَيْهِمْ عَمًى ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ يُنَادَوْنَ مِن مَّكَانٍۭ بَعِيدٍ ﴿٤٤﴾ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ فَٱخْتُلِفَ فِيهِ ۗ وَلَوْلَا كَلِمَةٌ سَبَقَتْ مِن رَّبِّكَ لَقُضِىَ بَيْنَهُمْ ۚ وَإِنَّهُمْ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مُرِيبٍ ﴿٤٥﴾ مَّنْ عَمِلَ صَٰلِحًا فَلِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَنْ أَسَآءَ فَعَلَيْهَا ۗ وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿٤٦﴾

﴿٤١﴾ بەبێگومان ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەم قورئانە نەکرد ئەو کاتەی کە هاتە لایان، تۆڵەیان لێوەردەگرین. وەبە بێگومان کە ئەوە پەڕاوێکی نایابو بەرێزە.

﴿٤٢﴾ کە نە لە ئێستایداو نە لەداهاتویدا شتی پڕوپوچ ناتوانێت ڕووی تێبکاتو شتێکی بێسودی تێدابەدی نەکراوەو ناکرێت، چونکە ڕەوانە کراوی ئەو زاتەیە کە زۆر داناو سوپاسکراوە.

﴿٤٣﴾ جگە لەو قسە خراپو نابەجێیانەی کە بە هەمو پێغەمبەرانی پێش تۆ وتراوە، شتێکی تازەتر بە تۆ ناوترێت، کە وابو ئارامگرە هەروەکو چۆن ئەوان ئارامیان گرت دڵنیابە ئەو خوا نەناسانە سزا دەدرێن هەروەکو چۆن ئەوانەی پێشو سزادران، بێگومان پەروەردگارت خاوەنی چاوپۆشیە بۆ ئەو کەسانەی ڕاستو دروستنو لە هەڵەکانیان پەشیمان دەبنەوەو خاوەنی تۆڵەی بەژانیشە بۆ ئەوکەسانەی لەسەر دژایەتی ئایینو شیرك دەمرن.

﴿٤٤﴾ ئەگەر ئەم قورئانەمان بەزمانی غەیرەعەرەبی ڕەوانە بکردایە بێگومان دەیان وت: چۆن وا دەبێت دەبوایە نیشانەکانی ڕۆشن بکرایەوە ئایا چۆن وا دەبیت کە ئەم قورئانە عەرەبی نەبێتو پێغەمبەر عەرەب؟! واتە شتی وا نابێتو ناگونجێت، بڵێ ئەو قورئانە ڕێنمایو چارەسەری نەخۆشیە لاشەییو دەرونیەکانە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان پێی هێناوە، وەئەو کەسانەش کە باوەڕی پێناکەن لەناو گوێچکەیاندا باری قورس هەیەو کەڕنو هیچی لێ حاڵی نابەنو ئەوان کوێرنو جگە لە بەدبەختی سودێکی تری لێ وەرناگرن، بەڵێ ئەوەندە بێ ئاگاو دورن لە ڕاستیەوە هیچ لەو قورئانە تێناگەن وەکو ئەوە کە لە شوێنێکی دورەوە بانگ بکرێنو جگە لەدەنگەکە شتێکی تر حاڵی نەبن.

﴿٤٥﴾ جا بەراستی ئێمە ئەو پەڕاوەمان (تەورات) دا بە موسا عليه السلام جا یەك قسە نەبون تێیدا هەندێك باوەڕی پێکردو هەندێکیش بە درۆیان خستەوە( هەروەکو ئەم قورئانەی کە هاتوە بۆ تۆ ئەی محمد ﷺ ) جا ئەگەربڕیاری پەروەردگارت بە دواخستنی سزاو لێکۆڵینەوە لە هەمو خەڵکان پێش نەکەوتایە دەمێك بو هەر لە دنیادا بڕیاریان بەسەردا ئەنجام دەدرا لە بارەی ئەو ناڕێکیەی کە هەیانە سەبارەت بە ئایینو بەپێغەمبەر ﷺ بێگومان ئەوان گومانیان هەیە لەم قورئانەو زۆر لێی دوو دڵن.

ئەمەش دڵ نەواییەکە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ واتە: هەر تۆ نەبویت کە ئاوا گەلەکەت ڕێگای ئایینو بلاوکردنەوەی ئەو قورئانەت لێبگرنو بەدرۆت بخەنەوە، تەماشای موساو گەلەکەی بکەو بزانە چییان کردوە لەگەلیدا.

﴿٤٦﴾ هەر کەسێك ئیشی چاك بکات بۆ خۆی دەکاتو خۆی سودی لێوەردەگرێتو هەر کەسێکیش خراپە بکات تاوانی ئەو خراپەیە هەر بە مل خۆیەتیو پەروەردگارت ستەم لە هیچ بەندەیەکی ناکات.

﴿٤٧﴾ زانینی کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت هەر بۆلای زاتی خۆی دەگەڕێتەوەو کەس هیچی لێ نازانێت، هیچ میوەیەك لەناو کالانی نایەتە دەرو هیچ مێینەیەك ئاوس نابێو ئەو بارەی

۞ إِلَيْهِ يُرَدُّ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ ۚ وَمَا تَخْرُجُ مِن ثَمَرَٰتٍ مِّنْ أَكْمَامِهَا وَمَا تَحْمِلُ مِنْ أُنثَىٰ وَلَا تَضَعُ إِلَّا بِعِلْمِهِۦ ۚ وَيَوْمَ يُنَادِيهِمْ أَيْنَ شُرَكَآءِى قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٍ ﴿٤٧﴾ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَدْعُونَ مِن قَبْلُ ۖ وَظَنُّواْ مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ ﴿٤٨﴾ لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِمَا عَمِلُواْ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ ﴿٥١﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ثُمَّ كَفَرْتُم بِهِۦ مَنْ أَضَلُّ مِمَّنْ هُوَ فِى شِقَاقٍۭ بَعِيدٍ ﴿٥٢﴾ سَنُرِيهِمْ ءَايَٰتِنَا فِى ٱلْءَافَاقِ وَفِىٓ أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ ٱلْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُۥ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾ أَلَآ إِنَّهُمْ فِى مِرْيَةٍ مِّن لِّقَآءِ رَبِّهِمْ ۗ أَلَآ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطٌۢ ﴿٥٤﴾

دانانێت مەگەر بە گوێرەی زانیاری ئەو زاتە بێت، جا ئەو ڕۆژە بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: لەکوێن هاوبەشەکانم؟ دەڵێن: پێمان ڕاگەیاندویت کە لەناو ئێمەدا شایەتیەك نیە کە بڵێت: تۆ هاوبەشت هەیەو دان بە هەڵەی خۆیاندا دەنێین، چونکە ئەوە قیامەتەو هەمو شتێکیان بۆ ڕۆشن بوەتەوە.

﴿٤٨﴾ جا ئەوانەی کە لە پێشدا هاواریان لێدەکردنو دەیان پەرستن وا ئێستا لێیان گوم بوونو دڵنیا بوون کە هیچ پەناگایەکیان نیەو بێچارەو بێدەرتانن. جا پێم بڵێن: ئەوانەی کەتۆلەدنیادا پەنایان بۆدەبەیتو پێت وایە دەتوانن لەدوارۆژدا بێن بەهاوارتانەوە ئەوانە هەرخۆیا خودان یان غەیری خودان؟ ئەگەر دەڵێن: ئەوانیش هەرخودان ئەوەئیتر قسەمان لەگەڵتان نیە ئەوەندە کوفرەکەتان گەورەو ئاشکرایە، وەئەگەر دەشڵێن: غەیری خودان دەی بەوە دەبێت بە موشریكو هاوەڵ دانەر بۆخوداو بە بێ تەوبە کردنو پەشیمان بونەوە لەو تاوانە خوا عەفوت ناکات، دەی ژیر بەو بە درۆو دەلەسەی دنیا بەدینخۆران خۆت شەرمەندەی خواو پاشەڕۆژت مەکە .

﴿٤٩﴾ مرۆڤ لە داواکردنی ماڵو تەندروستیو شتی چاك وەڕەس نابێت خۆ ئەگەر زیانێکی توش هات ئەوسا وا نائومێدو داماو دەبێت کە بە سەرو سیمایدا دەردەکەوێت.

﴿٥٠﴾ جا ئەگەر پاش ئەو زیانەی کە توشی هاتووە تامی خۆشیمان پێچەشتو بارودۆخی ژیانمان بۆچاك کرد بە دڵنیاییەوە دەڵێت: ئەمە بۆ منە، واتە: خۆم شایستەی ئەمەمو وا دەزانم کە قیامەت نایەت، خۆ ئەگەر وەکو پێغەمبەران دەڵێن ڕاست بو گەڕێنرامەوە بۆ لای پەروەردگارم ئەوە لەوێش هەر چاکترم بۆ هەیە، ئەم مرۆڤە نەزانو خۆ پەسەندە، وا دەزانێ چۆن لە دنیادا چاکەی لەگەڵدا کراوە هەروەها پاشە ڕۆژیش وا دەبێت، بێ ئاگایە لەوەی کە چاکەی ژیانی دنیا تەنها بۆ تاقیکردنەوەیەو هیچی تر جا کێ لەم تاقیکردنەوەدا دەرچو ئەوە لە قیامەتیشدا سەرفەرازەو کێیش دەرنەچو ڕیسواو شەرمەندەیە، ئەوەتە کە پەروەردگار لە وەڵامی ئەو بۆچونە هەڵەدا دەفەرموێ: ئەوسا بە دڵنیاییەوە بەو کەسانەی کە خوانەناسبون هەواڵی ئەو کردارەیان پێدەدەین کە کردویانو سزای چڕو پڕو توندیان پێدەچەژین.

﴿٥١﴾ خۆ هەر کاتێك کە فەڕو بەرەکەتی خۆمان بەسەر مرۆڤدا برڕێژین لەجیاتی سوپاس کردندا لە خۆی بایی دەبیتو گوێ بە ئایین ناداتو بە لوت بەرزیەوە لای تێدەکات، ئەوسا هەر کاتێکیش دوچاری زیانو ناخۆشی ببێت خاوەنی پاڕانەوەی پانو بەرینە.

﴿٥٢﴾ بڵێ: پێم بێژن ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن پەروەردگارەوە بێتو پاشان ئێوە باوەڕی پێنەکەن، کێ گومڕاترە لەو کەسەی کە لە بارەی ئەم قورئانەوە لە ناڕێکیو دڵەڕاوکێیەکی زۆر دوور لە ڕاستی دابێت؟ هیچ کەس. ئینجا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٥٣﴾ بەم زوانە لەم بونەوەرەو لەناو خودی خۆیاندا نیشانەکانی خۆمانیان پیشان دەدەین تا ڕۆشن ببێتەوە بۆیان کە بێگومان ئەو زاتە ڕاستەو تاك وتەنیایەو هاوەڵی نیە، ئایا هەروا دژایەتیت دەکەن؟ ئەی پەروەردگارت بەس نیە بۆ تۆ لە حاڵێکدا کە هیچ گومانی تێدا نیە کەخۆی ئاگادارە بەسەر هەمو شتێکدا؟

﴿٥٤﴾ بزانن کە بێگومان ئەوانە لە گەیشتن بە پەروەردگاری خۆیان بۆ حیسابو پاداشتو سزا لە گوماندان، بزانن کە بێگومان ئەو گەمارۆی هەمو شتێکی داوە بەجۆرێك کە هیچ شتێك لە دەرەوەی بازنەی زانیاریو دەسەڵاتی ئەودا نیە. دەڵێن: عومەری کوڕی عەبدولعەزیز چوە سەر دوانگەو سوپاسو ستایشی (اللَّهُ)ی کردو وتی: لەپاشدا، ئەی خەڵکینە من ئێوەم کۆ نەکردوەتەوە بۆ ئەوەی باسی ڕوداوێکتان بۆ بکەم بەڵام بیرم لە هاتنی قیامەتو حیسابو کیتابێك کردەوە کە ئێوە بۆی دەچن، جا زانیم ئەوەی باوەڕی بەمە هەیە ساویلکەو کەم عەقڵە، ئەوەیش کە باوەڕی پێناکات لەناوچوە، چونکە ئەوەی کەباوەڕی پێی هەیە

پاڵی لێداوەتەوەو بەگوێرەی پێویست بۆی هەوڵ نادات کەواتە کەم عەقڵە، ئەوەیش کە باوەڕی پێی نەبێ ئاشکرایە کە لەناو چوە.

## سورەتی شورا

٤٢ — ٥٣

سورەتی شورا بە ئەلفولامەوە کە سورەتی چلو دووهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، پەنجاو سێ ئایەتە، هەندێك دەڵێن ئایەتی ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ بە سێ ئایەتی تروەوە لە مەدینەدا هاتۆتە خوارەوەو بە سورەتی حم عسق، سورەتی عسق، سورەتی حم سقو سورەتی شورا بەبێ ئەلف لام ناو دەبرێت. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستونۆهەمەو پاش سورەتی (الكهف) و پێش (إبراهيم) دابەزیوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١) (٢) حا ،میم. عین، سین، قاف، هەر خوا خۆی دەزانێت مەبەست چیە لەم پیتانە.

(٣) هەر ئاوایە بۆ لای تۆو لای ئەو کەسانەش کە لە پێش تۆدابون (اللّٰه)ی بە دەسەڵاتو دانا وەحی کردوەو پەیامی خۆی بۆ ناردون.

حاریسی کوڕی هیشام پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد کە چۆن وەحیت بۆ دێت فەرموی: {أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ فَيُفْصَمُ عَنِّي وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِي الْمَلَكُ رَجُلًا فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ قَالَتْ عَائِشَةُ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا /متفق عليه/ هەندێ جار وەحیم بۆ دێت وەکو دەنگی جەرەس کە ئەوە زۆر سەختە لەلام جا کە جیا دەبێتەوە لێم لە کاتێکدا کە ئەوەی کە وتویەتی لەبەرم کردوە، وە هەندێ جاریش ئەو فریشتەیە (جبرەئیل) وەکو پیاوێك دێتە لامو قسەم لەگەڵدا دەکات، جا لەبەری دەکەم ئەوەی کە دەیڵێت، عائیشە دەیوت: بەراستی دیومە کە وەحی بۆ هاتوە ﷺ لە ڕۆژێکی زۆر ساردا کاتێك کە لێی جیا دەبویەوە عارەق بەناو چاوانیدا دەهاتە خوارەوە} . ئینجا دەفەرموێ:

(٤) ئەوەی لە ناو ئاسمانانو لەناو زەویدایە هەموی هەرموڵکی ئەو زاتەیەو هەر خۆی پایە بەرزو گەورەیە.

(٥) ئاسمانان لە ترسی اللّٰه خەریکە بەسەریەکدا شەقو پەق ببێتو فریشتەکانیش لەگەڵ سوپاسی پەروەردگاریاندا پاکو خاوێنیو بێ عەیبی ئەو باس دەکەنو بۆ ئەوانەش کە لەسەر

سُورَةُ الشُّورَىٰ — ٤٢ — ٥٣

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ عٓسٓقٓ ﴿٢﴾ كَذَٰلِكَ يُوحِيٓ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ ٱللَّهُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٣﴾ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٤﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرۡنَ مِن فَوۡقِهِنَّۚ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يُسَبِّحُونَ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَيَسۡتَغۡفِرُونَ لِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِۗ أَلَآ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥﴾ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ٱللَّهُ حَفِيظٌ عَلَيۡهِمۡ وَمَآ أَنتَ عَلَيۡهِم بِوَكِيلٖ ﴿٦﴾ وَكَذَٰلِكَ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّتُنذِرَ أُمَّ ٱلۡقُرَىٰ وَمَنۡ حَوۡلَهَا وَتُنذِرَ يَوۡمَ ٱلۡجَمۡعِ لَا رَيۡبَ فِيهِۚ فَرِيقٞ فِي ٱلۡجَنَّةِ وَفَرِيقٞ فِي ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَهُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمُونَ مَا لَهُم مِّن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٍ ﴿٨﴾ أَمِ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۖ فَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡوَلِيُّ وَهُوَ يُحۡيِ ٱلۡمَوۡتَىٰ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٩﴾ وَمَا ٱخۡتَلَفۡتُمۡ فِيهِ مِن شَيۡءٖ فَحُكۡمُهُۥٓ إِلَى ٱللَّهِۚ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبِّي عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ﴿١٠﴾

زەویدان، داوای لێ بوردنیان بۆ دەکەن، جا بزانن بێگومان کە اللّٰه هەر خۆیەتی لێبوردە لە تاوانی بەندەکانیو بە بەزەیشە بۆیان.

(٦) جا ئەو کەسانەی کە جگە لە ئەو زاتە بۆ خۆیان دۆستانێکی تر دەگرنو دەیان پەرستن، اللّٰه ئاگای لێیانەو تۆ زامنیان نیت. وە ئۆباڵی کرداری ناپەسندی خۆیان لەسەر شانی خۆیانەو تۆ هەر ترسێنەرێکی بۆ ئەوانو اللّٰه بەسەریاندا زاڵەو دەزانێ چی دەکەن.

(٧) جا هەرئاوەها قورئانێکی عەرەبیشمان ناردە لات تا تۆ خەڵکی مەکەو ئەو کەسانەی چواردەوری لە سزای اللّٰه بترسێنی، وە هەروەها خەڵك لە ڕۆژی کۆکردنەوەی هەمو دروستکراوەکان کە ڕۆژی حیسابو پردو دۆزەخە بترسێنی کە هیچگومان لە هاتنی ئەو ڕۆژەدا نیە، جا خەڵك جیا دەکرێنەوە هەندێك بۆ بەهەشتو تاقمێکیش بۆ ناو دۆزەخو ئاگری داغو سوتێنەر.

(٨) جا ئەگەر اللّٰه ئارەزوی لێ بووایە دەیکردن بە یەك گەلو لەسەر یەك ئایین کە ئیسلامە بەڵام اللّٰه خەڵکی سەرپشك کردوە لە هەڵبژاردنی ڕێگای باشو خراپ تا چاکان بەهۆی کاری چاکیانەوە بخاتە ناو بەهەشتەوەو خراپانیش بۆ دۆزەخ، ئەوسا ستەمکاران هیچ دۆستو یارمەتی دەرییەکیان نیە نە لە دنیاداو نە لە دواڕۆژدا.

فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا
وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ
وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١١﴾ لَهُۥ مَقَالِيدُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
يَبۡسُطُ ٱلرِّزۡقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقۡدِرُۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٢﴾
۞ شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحٗا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ
إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓۖ أَنۡ أَقِيمُواْ ٱلدِّينَ
وَلَا تَتَفَرَّقُواْ فِيهِۚ كَبُرَ عَلَى ٱلۡمُشۡرِكِينَ مَا تَدۡعُوهُمۡ إِلَيۡهِۚ ٱللَّهُ
يَجۡتَبِيٓ إِلَيۡهِ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِيٓ إِلَيۡهِ مَن يُنِيبُ ﴿١٣﴾ وَمَا
تَفَرَّقُوٓاْ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ
سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى لَّقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ
أُورِثُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُ مُرِيبٖ ﴿١٤﴾
فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ
وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ
بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ
لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٥﴾

﴿٩﴾ ئایا جگە لەو زاتە کەسێکی تر دەکەن بە دۆست بۆخۆتان لەحاڵێداکە ﷲ خۆی یارمەتی دەری باوەڕدارانەو هەر خۆیەتی کە مردوان زیندو دەکاتەوەو هەر ئەو زاتەیە توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە؟

﴿١٠﴾ جا لەسەر هەر شتێك ڕێك نەکەوتن‌و ناکۆکی کەوتە نێوانتانەوە ئەوسا بڕیاری یەکلاکردنەوەی ئەوە هەر لەلای (ﷲ)یەو نابێ بەرەو جێگاو کەسی تر بڕۆن، ئەو (ﷲ)یەی کەباسی ئەکەم پەروەردەگارمە، هەر بەو زاتەش پشت دەبەستم‌و هەر بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوەو هەمو بڕیارێك هەر لەو وەردەگرم.

﴿١١﴾ ئەو زاتەدروستکەری هەمو ئاسمانان‌و زەوییەو لەخۆتان هاوسەرانی بۆ دروستکردون‌و لە چوار پێیانیش نێرو مێی داناوە، تا بەهۆی ئەو جوتەوە زۆرتان بکات، هیچ شتێك وێنەی ئەو نیەو هەر خۆی بیسەری هەمو گوفتارێکەو بینەری هەمو ڕەفتارێك.

﴿١٢﴾ کلیلی هەمو کاروبارەکانی ئاسمانان‌و زەوی هەر بە دەست ئەوە کە بۆ هەر کەسێك ئارەزۆی لێ بێت ڕۆزی فرەوان دەکات‌و دەیشیگرێتەوە لەوکەسەیش کەئارەزۆی لێ بێت، بێگومان کە ئەو بەسەر هەمو شتێکدا زانیاری زۆرە. جا ئەو زیادو کەمییەی نێوانی خەڵك هەموی دادپەروەرانەو دانایانەیەو لەسەر بناغەی ئەو زانیاریە زۆرەی خۆیەتی.

﴿١٣﴾ ﷲ ئایینێکی بۆداناون کە هەر ئەوەیە بەنوحیشی را سپاردوە،وە ئەوەی کە ئێمە ناردومانە لای تۆ و ئەوەی کە ئامۆژگاری ئیبراهیم‌و موساو عیسامان پێکردوە ئەوەیە کە: ئەم ئایینەی کە بۆم ناردوون دەستی پێوە بگرن‌و بەش بەش مەبن تێیدا، واتە ئایینی پێغەمبەران هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتەم لە بنەڕەتا یەکن‌و هیچ جیاوازیەکی تێدانیەو تەنها لە لق‌و پۆپدا جیاوازیان هەیەو بە پەیڕەوانی هەمویشیان وتراوە بەش بەش مەبن، چونکە ئەو بەش بەشیە سەرەڕای لاوازبون‌و سەرشۆڕی لەدنیادا دەبن بە حیزب‌و پێڕو شەخس پەرست‌و دەچنە ڕیزی موشریکانەوە، بۆیە بەدوای ئەو قەدەغە کردنی بەش بەشیەدا دەفەرموێ: ئەوەی کەتۆ بانگیان دەکەیت بۆ لای کە دەست گرتن بە ئایین‌و بەش بەش نەبونە سەختە لەلای هاوبەش دانەران؟! ﷲ ئارەزۆی لەهەر کەسێك هەبێت هەڵیدەبژێرێت‌و هەر کەسێکیش بە دڵ بگەڕێتەوە بۆ لای ئەو ڕێنمایی دەکات‌و دەیگەیەنێت بە خۆشبەختی هەتاهەتایی.

﴿١٤﴾ جا ئەمانە پارچە پارچە نەبون مەگەر پاش ئەوەی کە زانیاری باشیان هاتبوە لا کە ئایینی ئیسلامە ئەمەش تەنها لەبەر ئیرەیی‌وحەسادەت و دوژمنایەتی ئەم دینەبوە نە شتێکی تر، چونکە هەمویان لەپێشدا یەك دەنگ بون کە ئەگەر پێغەمبەرو ئایینی تازە هات بەدڵ‌و بەگیان وەری دەگرین بەڵام کاتێك کە هات لەبەر ئیرەیی ئاوایان بەخۆیان کرد، خۆ ئەگەر بڕیاری پەروەردگارت پێش نەکەوتایە بە دواخستنی سزا، هەر زۆر زوو کاریان بە سزادان یەکسەر دەکرایەوە، بێگومان ئەوانەی کە پەڕاوی خودایان بۆ بەجێما تێیدا کەوتنە دوودڵبون لێی.

﴿١٥﴾ جا لەبەر ئەمە تۆش بانگی خەڵك بکە بۆ ئەم ئایینەو ڕاست‌و دروست لەسەری بوەستەو ئەم لاو ئەولا مەکە وەکو چۆن فەرمانت پێکراوە،وە پەیڕەوی لە ئارەزۆی ئەوان مەکەو بڵێ: باوەڕم هەیە بەو پەڕاوانەی کەﷲ ڕەوانەی کردون‌و فەرمانم پێکراوە کە بە دادپەروەرانە هەڵس‌و کەوتتان لەنێواندا بکەم، ﷲ پەروەردگارمانەو پەروەردگارتانە، کرداری خۆمان هەر بۆ خۆمان‌و کرداری خۆتان هەر بۆ خۆتان، لەنێوان ئێمەو ئێوەدا هیچ بەڵگەیەك نیە کە باس نەکرابێت، ﷲ لەگەل یەکدا لە

وَٱلَّذِينَ يُحَآجُّونَ فِي ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مَا ٱسۡتُجِيبَ لَهُۥ حُجَّتُهُمۡ دَاحِضَةٌ عِندَ رَبِّهِمۡ وَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ وَلَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٌ ﴿١٦﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ يَسۡتَعۡجِلُ بِهَا ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِهَاۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مُشۡفِقُونَ مِنۡهَا وَيَعۡلَمُونَ أَنَّهَا ٱلۡحَقُّۗ أَلَآ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُمَارُونَ فِي ٱلسَّاعَةِ لَفِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٍ ﴿١٨﴾ ٱللَّهُ لَطِيفُۢ بِعِبَادِهِۦ يَرۡزُقُ مَن يَشَآءُۖ وَهُوَ ٱلۡقَوِيُّ ٱلۡعَزِيزُ ﴿١٩﴾ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلۡأٓخِرَةِ نَزِدۡ لَهُۥ فِي حَرۡثِهِۦۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرۡثَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴿٢٠﴾ أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ وَلَوۡلَا كَلِمَةُ ٱلۡفَصۡلِ لَقُضِيَ بَيۡنَهُمۡۗ وَإِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٢١﴾ تَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ مُشۡفِقِينَ مِمَّا كَسَبُواْ وَهُوَ وَاقِعُۢ بِهِمۡۗ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فِي رَوۡضَاتِ ٱلۡجَنَّاتِۖ لَهُم مَّا يَشَآءُونَ عِندَ رَبِّهِمۡۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿٢٢﴾

قیامەتدا کۆمان دەکاتەوە، خۆسەرەنجام هەر بۆ لای ئەویشە گەرانەوەمان.

﴿١٦﴾ جا ئەو کەسانەی کە دەمە دەمە دەکەن لەزاتی (اللَّهُ)دا دوای ئەوەی کە وەڵامی دراوەتەوەو کەسانێك بەو باوەڕیان هێناوە بەڵگەکانیان پوچو هەڵوەشاوەیەو ڕقو تورەیی پەروەردگاریان وەکو چادرێك لەسەرەو سزایەکی سەختیان بۆ هەیە لەسەر ئەو دەمەدەمەو دژایەتی کردنەیان.

﴿١٧﴾ اللَّهُ ئەو زاتەیە کە تەواوی پەڕاوەکانی ڕەوانە کردوەکە سەراپا حەق وراستن‌و میزانیشی ناردوە تا خەڵکی فێری دادپەروەری ببن لەکێشانە وپێوانەو تەواوی بڕیارو کاروباریاندا، وە تۆ نازانیت؟ لەوانەیە کاتی هاتنی ڕۆژی دوایی نزیك بێت.

﴿١٨﴾ جا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو ڕۆژە نیە بەپەلەن بۆ هاتنی‌و بە گاڵتەوە چونکە بەڕاستی نازانن داوای هاتنی دەکەن بەڵام ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەو ڕۆژە هەیە لێیدەترسن‌و دەزانن کە ئەو ڕۆژە ڕاستەو دێت بەسەر ئەم مرۆڤ و بونەوەردا، بزانن بێگومان ئەو کەسانەی کە لە بارەی هاتنی قیامەتەوە گومانیان هەیە وان لەسەر لێشێواوییەکی دوور لە ڕاستیداو زۆر نابات پەشیمان دەبنەوە، بەڵام ئەو کاتە پەشیمانی بێسودە بۆیان.

﴿١٩﴾ اللَّهُ بە لوتفو بەسۆزە بۆ بەندەکانی، ئەو ڕۆزی دەدات بەوەی کە ئارەزۆی لێیەتی، جا هەر خۆی بە تواناو دەسەڵاتدارەو هەر شتێ ئارەزۆی لێبێت دەیکاتو هیچ بەربەرستێك ناتوانێ ڕێگای پێبگرێت.

﴿٢٠﴾ هەر کەسێك بەو کارو تەلاشەی دنیای خۆی دەسکەوتی ڕۆژی دوایی مەبەست بێت ئێمە ئەو نائومێد ناکەین‌و بەشی دەدەین‌و بۆیشی زیاد دەکەین، وە هەر کەسێکیش هەر دەسکەوتی دنیای مەبەست بێت هەندێکی لەوە پێدەدەین‌و لە ڕۆژی دواییدا هیچ بەشێکی تری نیە.

﴿٢١﴾ ئایا ئەوان هاوبەشانێکیان هەیە کە ئایینیان بۆ دانابن‌و پەیڕەوی لێبکەن لە حاڵێکدا کە اللَّهُ ماوەی بەوە نەداوە کە جگە لە بەرنامەی خۆی بەرنامەیەکی تر هەڵبژێرن‌و پەیڕەوی بکەن، ئەوسا ئەگەر دواخستنی بڕیاری جیاکەرەوەی حەق‌و ناحەق زووتر لەلایەن (اللَّهُ)وە نەدرایە کە ماوەیان پێبدرێت تا دەگەن بە کاتی خۆی بەبێشك دەمێك بو لەنێوانیاندا بە سزاو تۆڵە لێ سەندنیان ئیش کۆتایی پێ هاتبو. کەواتە ئەوانەی کە ئەمرۆ یاساو بەرنامە بۆ خۆیان دادەنێن بە هەر ناوێکەوە بێت ئەگەر بە زوویی تۆڵەیان لێ وەرناگیرێت با دڵخۆش نەبن بە کارەکانیان‌ولەخۆیان بای نەبن، اللَّهُ ماوە دەدات بە هەمو مرۆڤێك جا بە چاکەوە خەریك بێت یان بە خراپەوە تا کاتی دیاریکراوی دێت جا ئەوکاتە چاکە بە چاکە پاداشت دەداتەوەو خراپەیش بە سزاو ئاگری دۆزەخ جا بەڕاستی ئەو کەسانەی کە ئەم جۆرە بەرنامەو یاسایانە دادەنێن‌و پەیڕەوی لێوە دەکەن پێشەکی ستەم لە خۆیان‌و پاشان لە خەڵکیش بۆیە پەروەردگار بە ستەمکار ناویان دەباتو دەفەرموێ: بێگومان سزای بەژان هەیە بۆ ستەمکاران.

﴿٢٢﴾ ئەی بینەر لە ڕۆژی دواییدا تۆ دەبینی ستەمکاران لە سزای کاری خۆکردەیان دەترسن خۆ ئەو سزایەش تازە هاتوەتە سەریان‌و دەرچونیان نیە، وەلەولایشەوە دەبینی، ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە لەناو شوێنە سەیرانگاکانی باخچەکانداو ئەوەی کە خۆشیە لە نازو نیعمەت لەلایەن پەروەردگاریانەوە هەیانە، ئەوە هەر خۆی بەخششێکی گەورەیە بە خەڵات پەروەردگاریان بەوانی دەبەخشێت. جا بیر بکەرەوە بزانە تۆ لە کامیانی، ڕێبازی خوای گەورەو میهرەبانت هەڵبژاردوەو جگە لەو بە هیچ یاسایەکی تر ڕازی نابی یان بە پێچەوانە خۆتت داوە بە دەست واقیعی ناڵەبارەوەو هەر ڕۆژێك لەسەر پەتێك یاری دەکەیتو خۆیشت بە موسڵمان دەزانی؟!

ذَٰلِكَ ٱلَّذِي يُبَشِّرُ ٱللَّهُ عِبَادَهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِۗ قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰۗ وَمَن يَقۡتَرِفۡ حَسَنَةٗ نَّزِدۡ لَهُۥ فِيهَا حُسۡنًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ شَكُورٌ ﴿٢٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗاۖ فَإِن يَشَإِ ٱللَّهُ يَخۡتِمۡ عَلَىٰ قَلۡبِكَۗ وَيَمۡحُ ٱللَّهُ ٱلۡبَٰطِلَ وَيُحِقُّ ٱلۡحَقَّ بِكَلِمَٰتِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٤﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يَقۡبَلُ ٱلتَّوۡبَةَ عَنۡ عِبَادِهِۦ وَيَعۡفُواْ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ وَيَعۡلَمُ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢٥﴾ وَيَسۡتَجِيبُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضۡلِهِۦۚ وَٱلۡكَٰفِرُونَ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدٞ ﴿٢٦﴾ ۞ وَلَوۡ بَسَطَ ٱللَّهُ ٱلرِّزۡقَ لِعِبَادِهِۦ لَبَغَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَٰكِن يُنَزِّلُ بِقَدَرٖ مَّا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرُۢ بَصِيرٞ ﴿٢٧﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ ٱلۡغَيۡثَ مِنۢ بَعۡدِ مَا قَنَطُواْ وَيَنشُرُ رَحۡمَتَهُۥۚ وَهُوَ ٱلۡوَلِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٨﴾ وَمِنۡ ءَايَٰتِهِۦ خَلۡقُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَآبَّةٖۚ وَهُوَ عَلَىٰ جَمۡعِهِمۡ إِذَا يَشَآءُ قَدِيرٞ ﴿٢٩﴾ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴿٣٠﴾ وَمَآ أَنتُم بِمُعۡجِزِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَمَا لَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ مِن وَلِيّٖ وَلَا نَصِيرٖ ﴿٣١﴾

ئەمە قسەی خوایەو لە خوا بترسەو دنیا فریودەرەو بۆ کەس نامێنێ.

﴿٢٣﴾ ئەوە ئەو موژدەیە کە ﷲ دەیدات بەو بەندانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان ئەنجام داوە، ئەی محمد ﷺ بڵێ: من داوای هیچ پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەر ئەم بانگەوازە، بەلام ئەمەوێت دژایەتیم نەکەن و ئەو پەیوەندیە خزمایەتیەی کە لە نێوانماندایە نەیبچڕێنن، خۆ هەر کەسێکیش چاکەیەك بکات ئێمە چاکەکەی بە زیاترەوە پاداشت دەدەینەوە، بێگومان ﷲ چاوپۆشیکارە لە تاوانی بەندەکانیو پاداشت دەرەوەیە بە زیادەوە لەسەر چاکەکانیانو چاکەیان ناخاتە پشتگوێو هیچکەسیشی لەبیر ناچێتەوە. سەبارت بەمەبەستی ﴿قُل لَّآ أَسۡـَٔلُكُمۡ عَلَيۡهِ أَجۡرًا إِلَّا ٱلۡمَوَدَّةَ فِي ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ لە عەبدولا ی کوڕی عەباس پرسیار کرا سعید کوری جوبەیر پێش ئەو وەلامی داوەو وتی:مەبەست خۆشەویستی خزمەکانی پێغەمبەرە ﷺ ، عەبدولای کوڕی عباس وتی: پەلەت کرد چونکە هیچ هۆزێکی قورەیش نیە کە خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ نەبوبێت، بەلام مەبەست ئەوەیە کە:{ فَنَزَلَتْ عَلَيْهِ إِلَّا أَنْ تَصِلُوا قَرَابَةً بَيْنِي وَبَيْنَكُمْ / البخاري/ ئەو ئایەتە دابەزیوەتە سەری واتە: ئەگەر باوەڕیشم پێناکەن، من هەر ئەوەم دەوێت کە پەیوەندی خزمایەتی نێوانمان نەبچڕێنن}.

﴿٢٤﴾ ئایا ئەمانە دەڵێن پێغەمبەر ﷺ درۆ بەدەم (ﷲ)وە دەکات، جا ئەگەر ﷲ ئارەزوی لێبێت دڵت مۆر دەکات کە هیچ وەرنەگرێتو لە هیچ حاڵی نەبێت، خۆ ﷲ بە فەرمانی خۆی شتی پڕوپووچ لەناو دەباتو ڕاستی دەچەسپێنێ، بەڕاستی ئەو هەرچی لەناو دڵەکاندایە دەیزانێت. واتە: محمد ﷺ هیچی لێ ناکرێت لەسەر ئەم قسانەی کە بەلای ئێوەوە ڕاست نیە، بەڵکو بەڕاستو ڕەوان ئەم پەیامە دەگەیەنێت چاك بزانن و دڵنیابن کە محمد پێغەمبەری خوایەو پەیامەکەی ڕاستو دروستەو لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆی ڕەوانە کراوە.

﴿٢٥﴾ جا هەر ئەو زاتەیە کە پەشیمانی لە بەندەکانی خۆی قەبوڵ دەکاتو لە خراپەکان چاوپۆشی دەکاتو دەزانێ بەوەی کە دەیلێن و دەیکەن.

سەبارەت بە پەشیمان بونەوەو تەوبە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { لَلَّهُ أَشَدُّ فَرَحاً بِتَوبَةِ عَبدِهِ مِن أحَدِكُم يَجِدُ ضَالَّتَهُ فِي المَكَانِ الَّذِي يَخَافُ أنْ يَقتُلَهُ فِيهِ العَطَشُ /مسلم/ بێگومان کە ﷲ زۆر کەیفخۆشترە بە پەشیمان بوونەوەی بەندەی خۆی لەو کەسەی ئێوە کە وشتری ونبوی خۆی بەئاوو خواردنەوە دەستکەوێتەوە لە جێگایەکدا کە ترسی ئەوەی هەبێت کە لە تینویەتیدا بمرێت، ئەگەر ئەوبنەوبارگەی خۆیەی دەستی نەکەوتایەوە}.

﴿٢٦﴾ خۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان ئەنجام داوە ﷲ نزایان لێوەردەگرێتو بە هانایانەوە دێتو لە چاکەی خۆیشیان زیاتر پاداشتیان پێدەداتەوە، وە بۆ ئەو کەسانەی کە خوانەناسن سزای توند هەیە.

﴿٢٧﴾ دەڵێن: ئەو کۆمەڵە هاوەڵە هەژارانەی کەبەناو (أصحاب الصفه) بەناوبانگ بون ئاواتیان دەخواست کە ئەگەر خوا ماڵی پێبدایانایە ئاواو ئاوامان دەکرد، جا ئەم ئایەتە دابەزی. واتە: ئەگەر ﷲ بژێوی بەبێ سەروبەر بدایە بە بەندەکانی لەم سەر زەویدا هەمو لە خۆبایی دەبونو ستەمیان دەکردو هەرگیز تێر نەدەبون، بەلام ئەو بەو ئەندازەی کە خۆی دەیەوێتو بەسودی بەندەکانیەتی ڕەوانەی دەکات، بێگومان کە ئەو زۆر بەئاگایە بەناو دەرونی مرۆڤەکانو بینەری کردارەکانیانە.

﴿٢٨﴾ جا هەر ئەوە کە لەپاش نائومێد بونی خەڵك لەباران، باران ڕەوانە دەکاتو خەیرو فەری خۆی بلاودەکاتەوە، وەهەر خۆیەتی کە بەدڵسۆزیەوە سەرپەرشتی مرۆڤ دەکات، کەزۆر سوپاس بۆ کراوە.

﴿٢٩﴾ خۆ هەندێکی تر لە بەڵگەکانی دەسەڵاتو هێزو زاناییو ئاگایی ئەو زاتە دروستکردنی ئاسمانانو زەوییە، وەئەو هەمو

جانەوەرانەیش کە لەناویاندا بڵاوی کردونەتەوە، ئەوسا هەر خۆیشی هەر کاتێ ویستی دەسەڵاتی هەیە بەسەر کۆکردنەوەیاندا.

(٣٠) جا هەر تەنگ و چەڵەمەیەکتان دووچار بوبێت هەر بە هۆی تاوانی خۆتانەوەیەو لە زۆریك لە تاوانەکانتان چاوپۆشی دەکات. کەواتە پەروەردگار لە زۆرێك لە تاوانەکان کە مرۆڤ دەیکەن چاوپۆشی دەکات بەڵام هەندێکیتر دەبن بەهۆی دوچار بونی بەڵاو کۆسپ بۆ مرۆڤ، وە ئەم بەڵاو تەنگانە لە راستیدا خۆی جۆرێکە لە لێبوردنی پەروەردگار تاکو بە وەرگرتنی تۆڵە لە بەندەکانی لەم دنیادا تۆڵەی ئەو دنیایان لەسەر نەمێنێ، وەك پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {مَا مِنْ شَيْءٍ يُصِيبُ الْمُؤْمِنَ حَتَّى الشَّوْكَةِ تُصِيبُهُ إِلَّا كَتَبَ اللَّهُ لَهُ بِهَا حَسَنَةً أَوْ حُطَّتْ عَنْهُ بِهَا خَطِيئَةٌ /مسلم/ باوەڕدار هیچ گرفتارییەکی توش نابێت تەنانەت دڕکێك کەبەلەشیدا بچێت مەگەر ﷲ چاکەیەکی بۆ تۆمار بکات یان خراپەیەکی لەسەر لابدات} کەواتە گرفتارییەکانی دنیا بۆ باوەڕداران هەر خەیرو چاکەیە هەر چەند لە رواڵەتا بارێکی سەختو گران بێت.

(٣١) خۆ ئێوە ناتوانن لەم سەر زەویەدا خۆتان لە دەست ﷲ ڕزگار بکەنو خۆتان حەشار بدەن، ئەوسا جگە لە (ﷲ)یش هیچدۆستو یارمەتی دەرێکتان نیە، واتە: ژیر بنو لەو بترسنو دەست بە ڕێبازی ئەوزاتەوەبگرن تا یارمەتیتان بداتو بێت بە هاناتانەوە.

(٣٢) جا هەندێکی تر لە نیشانەکانی هێزو دەسەڵاتی ئەوزاتە ئەو کەشتیە گەورەو گرانانەن کە وەکو چیا لە دورەوە دیارنو بە ناو دەریاکاندا دێنو دەڕۆن بۆ ئازو گویاز کردنو هێنانو بردنی کەلو پەلی پێویست لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر.

(٣٣) ئەگەر خوا ئارەزۆی لێبێت (با) دەوەستێنێ، ئەوسا ئەو کەشتیانە لەسەر ئەو ئاوەی دەریا دەوەستن. پێم خۆشە ئەمە کەمێ ڕۆشنتر بکەمەوە، کاتی خۆیو ئەو سەردەمەی کە ئەم قورئانەی تێیدا دابەزیوە ئەو کەشتیە گەورانە بەهۆی باوە گەشتو گەڕانیان پێکراوە کە ئاگرو بەنزینو گازو شتی تر نەبوە ئێستا لەوانەیە کە کەشتیەکان زۆر زۆر گەورەو گرانتر دروستکراونو بەو شتانە کار دەکاتو با ئەم لاو ئەولای پێ ناکات بەڵام ئەوەی ڕاستی بێت ئەگەر جوان سرنجی ئایەتەکە بدەین دەبینین دەفەرموێ: ئەگەر ئارەزۆی لێ بێت ئەو بایە دەوەستێنێ، جا ئەو کاتە کەشتیەکانیش دیسان ناتوانن هاتوچۆ بکەن، چونکە ئەگەر با بوەستێت نەك ئاگرەکان هیچیان ڕۆشن نابن بەڵکو هەموگیان لەبەرانیش کە هەناسە دەدەن دەخنکێن؟ کەوابو پێك

وَمِنْ ءَايَٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَٰمِ (٣٢) إِن يَشَأْ يُسْكِنِ ٱلرِّيحَ فَيَظْلَلْنَ رَوَاكِدَ عَلَىٰ ظَهْرِهِۦٓ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّكُلِّ صَبَّارٍ شَكُورٍ (٣٣) أَوْ يُوبِقْهُنَّ بِمَا كَسَبُوا۟ وَيَعْفُ عَن كَثِيرٍ (٣٤) وَيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِىٓ ءَايَٰتِنَا مَا لَهُم مِّن مَّحِيصٍ (٣٥) فَمَآ أُوتِيتُم مِّن شَىْءٍ فَمَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ (٣٦) وَٱلَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلْإِثْمِ وَٱلْفَوَٰحِشَ وَإِذَا مَا غَضِبُوا۟ هُمْ يَغْفِرُونَ (٣٧) وَٱلَّذِينَ ٱسْتَجَابُوا۟ لِرَبِّهِمْ وَأَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ (٣٨) وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَابَهُمُ ٱلْبَغْىُ هُمْ يَنتَصِرُونَ (٣٩) وَجَزَٰٓؤُا۟ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا ۖ فَمَنْ عَفَا وَأَصْلَحَ فَأَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلظَّٰلِمِينَ (٤٠) وَلَمَنِ ٱنتَصَرَ بَعْدَ ظُلْمِهِۦ فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَا عَلَيْهِم مِّن سَبِيلٍ (٤١) إِنَّمَا ٱلسَّبِيلُ عَلَى ٱلَّذِينَ يَظْلِمُونَ ٱلنَّاسَ وَيَبْغُونَ فِى ٱلْأَرْضِ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤٢) وَلَمَن صَبَرَ وَغَفَرَ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ (٤٣) وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن وَلِىٍّ مِّنۢ بَعْدِهِۦ ۗ وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ يَقُولُونَ هَلْ إِلَىٰ مَرَدٍّ مِّن سَبِيلٍ (٤٤)

هاتەی قورئان هەروا سادەو ئاسان نیە بەڵکو موعجیزەیەکی گەورەیەو پێویستە زیاتر بە دەقەکانی باوەڕمان جۆش بدەین، ئینجا دەفەرموێ: بێگومان چەندین بەڵگە لەوەدا هەیە بۆ هەمو مرۆڤێکی خۆگرو سوپاسگوزار.

(٣٤) یان بە هۆی کۆششی خراپی خۆیانەوە ئەو کەشتیانە لەناو ببات، کێ دەتوانێ ڕێگای لێبگرێت؟ خۆ لە زۆر تاوانیش چاوپۆشی دەکاتو مرۆڤ سزا نادات چونکە خاوەنی سۆزو میهرەبانیە بۆ هەمو دروستکراوەکانی کە مرۆڤ لە زۆربەیان بەرێز ترە.

(٣٥) جا تا ئەو کەسانەی کە کێشە دەکەن دەربارەی نیشانەکانی ئێمە بزانن کە هیچ ڕێگایەکی دەرچونیان نیە لەو سزایەی کە لە سەر تاوانەکانیان یەخەیان دەگرێت.

(٣٦) ئەو شتەی کە بە ئێوە دراوە هەر خۆشیەکی ژیانی دنیایەو ئەو شتەی کە لەلای (ﷲ)یەهەر ئەوە چاکەو بە پیتەو دەمێنێتەوە، جا ئەوە بۆ ئەو کەسانەیە کە باوەڕیان هێناوەو هەر بە پەروەردگاری خۆیان پشت دەبەستن.

(٣٧) جا بۆئەو کەسانەیە کە لە تاوانە گەورەکانو داوێن پیسی دوور دەکەونەوەو هەر کاتێکیش ڕقیان هەستێنن، رقی خۆیان دەخۆنەوەو عەفوو دەکەن.

وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ ﴿٤٥﴾ وَمَا كَانَ لَهُم مِّنۡ أَوۡلِيَآءَ يَنصُرُونَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن سَبِيلٍ ﴿٤٦﴾ ٱسۡتَجِيبُواْ لِرَبِّكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا مَرَدَّ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِۚ مَا لَكُم مِّن مَّلۡجَإٖ يَوۡمَئِذٖ وَمَا لَكُم مِّن نَّكِيرٖ ﴿٤٧﴾ فَإِنۡ أَعۡرَضُواْ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظًاۖ إِنۡ عَلَيۡكَ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَإِنَّآ إِذَآ أَذَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِنَّا رَحۡمَةٗ فَرِحَ بِهَاۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ فَإِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ كَفُورٞ ﴿٤٨﴾ لِّلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ يَهَبُ لِمَن يَشَآءُ إِنَٰثٗا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ أَوۡ يُزَوِّجُهُمۡ ذُكۡرَانٗا وَإِنَٰثٗاۖ وَيَجۡعَلُ مَن يَشَآءُ عَقِيمًاۚ إِنَّهُۥ عَلِيمٞ قَدِيرٞ ﴿٥٠﴾ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحۡيًا أَوۡ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوۡ يُرۡسِلَ رَسُولٗا فَيُوحِيَ بِإِذۡنِهِۦ مَا يَشَآءُۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٞ ﴿٥١﴾

(٣٨) خۆ بۆ ئەو کەسانەیشە کە وەڵامی پەروەردگاری خۆیانیان داوەتەوەو نوێژ دەکەن‌و لەنێوان خۆیاندا کاروباریان بە پرس‌و ڕای یەکترەو لەوەیش کە پێمان داون لەسەروەت‌و سامان دەبەخشن.

(٣٩) ئەوسا ئەو نیعمەتە هەتا هەتاییە بۆ ئەو کەسانەیە کە هەر کاتێك دەست درێژییەکیان بکرێتە سەر تۆڵە دەسێننەوە.

(٤٠) وە تۆڵەی خراپە هەر خراپەیەکە وەکو خۆی‌و نابێ زیاتر بکرێت، ئەوسا هەر کەسێکیش چاو پۆشی بکات لەو کەسەی کە ستەمی لێکردووەو هەوڵی ئاشتی بدات ئەوە پاداشتەکەی لەلای (ﷲ)یە، بێگومان کە ئەو زاتە ستەمکارانی خۆش ناوێت. لە فەرمودەدا هاتوە کە{وما زَادَ الله عَبداً بِعَفوٍ الا عِزاً/ مسلم /ﷲ بەندەی خۆی بە چاوپۆشی هەر بەرز دەکاتەوە} .

جا ﷲ دادگەری‌و تۆڵە سەندنەوەی داناوە لەناو بەندەکانیدا بەڵام ئاشتی‌و چاو پۆشی‌و چاکەی بەلاوە خۆشەویست ترە بۆ ناو بەندەکانی.

(٤١) جا ئەو کەسەی کە پاش ئەوەی کەستەمی لێکراو تۆڵەی سەندەوە ئەوسا ئەوانە هیچ تاوانێکیان لەسەر نیە، چونکە مافی خۆیان وەرگرتوەتەوە. ئەی کێ تاوانبارە؟

(٤٢) تاوان هەر لەسەر ئەو کەسانەیە کە لەم زەویداو بە ملهوڕی‌و بە ناحەق ستەم لە خەڵك دەکەن ، بۆ ئەوانە لە ڕۆژی قیامەتدا سزایەکی بەژان هەیە.

(٤٣) خۆ بەڕاستی ئەو کەسەی کە خۆی دەگرێت‌و چاو پۆشی دەکات لەو خراپانەی کە بەرامبەری دەکرێت لەحاڵێکدا کە دەتوانێ تۆڵە وەرگرێت ئەوە بەشێکە لە ئاکارو ڕەفتارە گرنگ‌و پەسەندەکان.

(٤٤) خۆ هەر کەسێکیش ﷲ سەری لێتێك بدات، ئەوسا لەپاش ئەو هیچ دۆستێکی تری نیە ڕێنمایی بکات، جا تۆ دەبینی ستەمکاران کاتێك کە چاویان بە سزا دەکەوێت هاواریان لێهەڵدەستێت‌و دەڵێن: ئایا هیچ ڕێگاو چارەیەکمان هەیە بۆ ڕزگاربون لەم سزایە؟ نەخێر تازە پەشیمانی‌و دان بە تاواندا نان هیچ سوودێکی نیە بۆیان.

(٤٥) جا کە دەیانبەنە سەر ئەو ئاگرە تۆ دەیان بینی لە شەرمەزاریدا چاوشۆڕن‌و بە دزیەوە لەژێرەوە چاوەو چاویانە تا بەڵکو دەرەتانێك بدۆزنەوە بۆ ڕزگاربونیان بەڵام تازە هەمو شتیان لەدەست داوەو ئەو کەسانەش کە باوەڕیان هێناوە دەڵێن: بێگومان لە ڕۆژی قیامەتدا ڕەنجەڕۆ ئەو کەسەیە کە خۆیشی‌و کەس‌وکاریشی لەدەست داوە، بزانن کە بێگومان ستەمکاران لەناو سزای هەمیشەییدان‌و هەرگیز ڕزگاریان نابێت.

(٤٦) جا بۆ ئەوان جگە لە ﷲ هیچ دۆستێکی تریان نیە کە یارمەتیان بدات‌و هەر کەسێکیش کە ﷲ گومڕاهی کرد، ئەوسا هیچ چارەو ڕێگایەکی تری نیە بۆ ڕزگاری‌و خۆشبەختی.

(٤٧) وەڵامی پەروەردگاری خۆتان بدەنەوەو پەیڕەوی فەرمانەکانی بکەن بەر لەوەی کە ڕۆژێ بێت لەلایەن (ﷲ)وە کە گەڕانەوەی نیە، جا ئەو کاتە هیچ پەناگایەکتان نیەو ناشتوانن نەحاشای لێ بکەن‌و نە خۆتان بگۆڕن تا نەناسرێنەوە.

(٤٨) جا ئەگەر پشتیان لەم ئاینە کرد، با بیکەن چونکە تۆمان ڕەوانە نەکردوە کە چاودێریان بیت، بێگومان ئێمە هەر کاتێك لەلایەن خۆمانەوە خەیرو خۆشی بدەین بە مرۆڤ بەوە شادمان دەبێت، خۆ ئەگەر بە تەنگ‌و چەڵەمەیەکیش گرفتار ببن بەهۆی کارو تەلاشی خراپی خۆیانەوە، ئەوسا بێگومان ئەو مرۆڤە زۆر سپڵەو نمەك نەناسەو هەمو خۆشیەکانی لە بیر دەچێتەوە.

(٤٩) ئاسمانان‌و زەوی هەر موڵکی (ﷲ)یە کەئەوەی ئارەزۆی لێ بێت دروستی دەکات، بە کەسێ کە ئارەزۆی لێ بێت کچ دەدات‌و بە کەسێکیش کەئارەزۆی لێ بێت کوڕ دەبەخشێ،

(٥٠) یان کورو کچیان پێدەداتو ئەوەیش کە ئارەزۆی لێبێت نەزۆکی دەکاتو هیچی پێنادات، بێگومان کە ئەو زۆر زانەرەو زۆر بە دەسەلاتە، واتە: خەڵکی کردوە بە چوار بەشەوە بەشێك هەر کوڕی پێدەداتو بەشێك هەر کچی پێدەداتو بەشێکیش کوڕو کچی پێدەداتو بەشێکیش هیچی پێنادات هەروەکو چۆن مرۆڤی بە چوار شێوە دروستکردوە بەشێکی بێ باب‌و دایك وەکو ئادەم ﷺ، وەبەشێکی سەری لای بابی هەیەو بێ دایکە وەکو حەوا، بەشێکی دایکی هەیەو بێ بابە وەکو عیسی ﷺ بەشەکەی تری لە باب‌و دایك دروستبون وەکو باقی خەڵکی تر، کەوابو پێویستە هەر خۆی بناسین‌و هەر بۆئەو بەندایەتی بکەین‌و هەر لەو داوای ماڵ‌و منداڵ بکەین، چونکە هیچ کەسی تر لەم بارەوە هیچی پێناکرێت.

ئینجا لە کۆتای سورەتەکەدا دەمان باتەوە بۆ باسی سەرەتای سورەتەکە، کە باسی وەحیەو جۆرەکانی‌و دەفەرموێ:

(٥١) ئەوسا هیچ مرۆڤێك نیە کە ﷲ لە دنیادا ڕوبەڕو قسەی لەگەڵدا کردبێت مەگەر شتێکی خستبێتە دڵیەوە یان لە پشتی پەردەوە وەکو لەگەڵ موسادا قسەکرا یان نێردراوی ناردوە ئەوسا ئەویش بە ئیزنی ﷲ ئەو شتەی کەئارەزۆی لێبوە پێیگەیاندوە، بێگومان ئەوزاتە پایە بەرزو دانایە.

(٥٢) جا هەر ئاوەها وەحیمان کردە لای تۆ بەشێك لە فەرمانەکانی خۆمان، هەروەکو ڕۆح چۆن پێویستە بۆ لەش هەر ئاوەها ئەم قورئانەش پێویستە بۆ پاك‌و خاوێنی‌وبۆ بوژانەوەی ڕۆح جا هەروەکو چۆن مرۆڤ بەبێ ڕۆح بە مرۆڤ نامێنێت، هەروەها مرۆڤیش بەبێ ئەم قورئانە وەکو مرۆڤ نامێنێت بەڵکو وەکو ئاژەڵەکانی تری لێدێت هەروەکو ئەمڕۆ ئێمە بە چاوی خۆمان دەبینین، تۆ ئەی محمد ﷺ لەپێشدا نەت دەزانی پەڕاو کامەیەو بڕوا چیە بەڵام ئێمە ئەم پەڕاوەمان کرد بە ڕوناکی تا بە ئەم قورئانە ئەو کەسەی کە ئارەزۆمان لێبێت لە بەندەکانمان ڕێنمایی بکەین‌و بیگەیەنینە خۆشبەختی ئەگەر خۆی گێل نەکات، بێگومان تۆ خەڵکی ڕێنمایی دەکەیت بۆ ڕێگای ڕاست. جا ئەو ڕێگا ڕاستەمان بۆ ئاشکرا دەکاتو دەفەرموێ:

(٥٣) ڕێگای ڕاست ڕێگای (ﷲ)یە ئەو زاتەی کە ئەوەی لە ئاسمانان‌و زەویدایە هەموی مولکی ئەوە، بزانن کە هەمو کارو

وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾

## ٤٣ سُورَةُ الزُّخْرُفِ ٨٩

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٣﴾ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ صَفْحًا أَن كُنتُمْ قَوْمًا مُّسْرِفِينَ ﴿٥﴾ وَكَمْ أَرْسَلْنَا مِن نَّبِىٍّ فِى ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٦﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن نَّبِىٍّ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٧﴾ فَأَهْلَكْنَآ أَشَدَّ مِنْهُم بَطْشًا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ لَيَقُولُنَّ خَلَقَهُنَّ ٱلْعَزِيزُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٩﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَجَعَلَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا لَّعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ ﴿١٠﴾

بارەکان سەرئەنجام بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە چ لە سەرەتاوەو چ لەکۆتاییدا، وە تەنها خۆیەتی بڕیاریان تێدا دەدات.

## ٤٣ سورەتی زوخروف ٨٩

سورەتی زوخروف کە سورەتی چلوسێ هەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتۆتە خوارەوە، هەشتاو نۆ ئایەتە ، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستو دووهەمەو پاش سورەتی (فصلت) و پێش (الدخان) دابەزیوە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١)(٢) حا،میم.سوێند بەم پەڕاوەی کە ڕۆشنکەرەوەی ڕاستو ناڕاستو چاك‌و خراپە.

(٣) بەڕاستی ئێمە ئەو پەڕاوەمان بە زمانی عەرەبی دانا ، بەڵکو ئێوە تێی بگەن‌و سودی لێوەرگرن.

(٤) سا بێگومان ئەو قورئانە لەلای ئێمە لە لەوحولمەحفوزدا تۆمار کراوە، پلەی بەرزە بەسەر هەمو پەڕاوەکانی تردا‌و پڕیەتی لە دانایی‌و لێزانی بۆ ئێوە تا پەیڕەوی بکەن‌و بگەن بە خۆشبەختی دنیاو دواڕۆژ، بەڵام ئێوە خۆتانی لێ گێل دەکەن‌و حەزتان لەو پەڕاوە نیەو نزمی‌و بێ نرخیتان بۆخۆتان دەوێت بەڵام پەروەردگارتان لەخۆتان دڵسۆزترە پێتان‌و بە گوێی ئێوە ناکات، وەك دەفەرموێ:

وَٱلَّذِى نَزَّلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ فَأَنشَرْنَا بِهِۦ بَلْدَةً مَّيْتًا ۚ
كَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ ﴿١١﴾ وَٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْأَزْوَٰجَ كُلَّهَا وَجَعَلَ
لَكُم مِّنَ ٱلْفُلْكِ وَٱلْأَنْعَـٰمِ مَا تَرْكَبُونَ ﴿١٢﴾ لِتَسْتَوُۥا۟ عَلَىٰ ظُهُورِهِۦ
ثُمَّ تَذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ رَبِّكُمْ إِذَا ٱسْتَوَيْتُمْ عَلَيْهِ وَتَقُولُوا۟ سُبْحَـٰنَ
ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ ﴿١٣﴾ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا
لَمُنقَلِبُونَ ﴿١٤﴾ وَجَعَلُوا۟ لَهُۥ مِنْ عِبَادِهِۦ جُزْءًا ۚ إِنَّ ٱلْإِنسَـٰنَ
لَكَفُورٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ أَمِ ٱتَّخَذَ مِمَّا يَخْلُقُ بَنَاتٍ وَأَصْفَىٰكُم
بِٱلْبَنِينَ ﴿١٦﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِمَا ضَرَبَ لِلرَّحْمَـٰنِ مَثَلًا
ظَلَّ وَجْهُهُۥ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿١٧﴾ أَوَمَن يُنَشَّؤُا۟ فِى
ٱلْحِلْيَةِ وَهُوَ فِى ٱلْخِصَامِ غَيْرُ مُبِينٍ ﴿١٨﴾ وَجَعَلُوا۟ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ
ٱلَّذِينَ هُمْ عِبَـٰدُ ٱلرَّحْمَـٰنِ إِنَـٰثًا ۚ أَشَهِدُوا۟ خَلْقَهُمْ ۚ سَتُكْتَبُ
شَهَـٰدَتُهُمْ وَيُسْـَٔلُونَ ﴿١٩﴾ وَقَالُوا۟ لَوْ شَآءَ ٱلرَّحْمَـٰنُ مَا عَبَدْنَـٰهُم ۗ
مَّا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَخْرُصُونَ ﴿٢٠﴾ أَمْ ءَاتَيْنَـٰهُمْ
كِتَـٰبًا مِّن قَبْلِهِۦ فَهُم بِهِۦ مُسْتَمْسِكُونَ ﴿٢١﴾ بَلْ قَالُوٓا۟
إِنَّا وَجَدْنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾

﴿٥﴾ هەر لەبەر ئەوەی كە ئێوە گەلێكی زیادەڕەوون و سودو زیانی دوارۆژی خۆتان نازانن ، ئێمە واز لەو یادەوەریەی ئێوە بهێنین و پشتگوێتان بخەین كە بە ئارەزوی خۆتان بجولێنەوەو ژیان و ژینگەی خۆتان خراپ بكەن؟ نەخێر ئێوە دروستكراوی ئێمەن و وەكو ئێمە دەتان ناسین ئاوا ئێوە خۆتان ناناسن ، لەبەر ئەوە ئەو بڕیارە نادەینە دەست ئێوەو ئەو ئەركە بەئێوە ناسپێرین ، چونكە ئێوە نازانن و ناتوانن یاساو بەرنامەیەكی دادپەروەرو یەكسان بۆ هەمو مرۆڤەكان دانێن و دروستكراوی خۆمانن و خۆمان دەتان ناسین، جا دەبێ تەنها لە ئێمە بەرنامەی ژیانتان وەرگرن، ئەگینان لێتان ڕازی نابین، هەر كەسێك هەر بەرنامەیەك هەڵبژێرێ بۆ خۆی بێجگە لە بەرنامەی ﷲ لێی وەرناگیرێت و لەدوارۆژدا لەریزی زیان لێ كەوتوو رەنجەڕۆیانە.

﴿٦﴾ خۆ لەناو گەلانی پێشودا ئێمە زۆرێك لە پێغەمبەرانمان رەوانە كردوە.

﴿٧﴾ جا هیچ پێغەمبەرێكیش نەهاتوەتە لایان مەگەر ئەوان گاڵتەیان پێكردبێت و باوەڕیان پێ نەهێنابێ.واتە : لەبێباوەڕی ئەم گەلەت خەم مەخۆ هەموگەلان هەروەك ئەمان بوون، بەڵام سەرئەنجام هەر راستی سەركەوتووە ناراستی هەر تڕۆودۆڕاو بوە.

﴿٨﴾ ئەوسا كەسانێك كە لەم گەلەی تۆ زۆردارتر بون بەهۆی سەرپێچیان لە بەرنامەی ﷲ و باوەڕ نەكردنیان بە پێغەمبەرەكەی خۆیان لەناومان بردن، داستانی پێشوەكانیش تێپەڕی، جا ئەمانیش ئەگەر هەر ئاوەها ڕەفتار بكەن دوچاری هەمان چارەنوس دەبن چونكە دابی خودا ناگۆڕێت.

﴿٩﴾ خۆ ئەگەر لێیان بپرسیت كە كێ ئەم ئاسمانان و زەویەی دروستكردوە بێگومان دەڵێن: ئەو زاتە بەدەسەڵاتە زۆر زانایە دروستیكردوە كە ﷲ یە .

﴿١٠﴾ ئەو زاتەی كە ئەم زەوییەی بۆ كردون بە بێشكەو جێگای ئارامگرتنتان و لەناویدا چەندین ڕێگای دروستكردوە بۆ هاتوچۆ كردنتان ، بەڵكو ئێوەش بە ئەو ڕێگایانە ڕێ دەربكەن و بە جێگای مەبەستی خۆتان بگەن، ئینجا بەڵكو ئێوەش بە وردبونەوە لەو ڕێگاو بانە جۆراوجۆرانە خوای خۆتان بدۆزنەوەو ڕێگای ڕاست بگرن.

﴿١١﴾ جا ئەو زاتەی كە لە ئاسمانەوە بە ئەندازەی پێویستی مرۆڤ ئاو دەنێرێتە خوارەوە ، ئەوسا بەو ئاوە وڵاتی وشك و بێ گژوگیا ئاودارو پڕ لە شینایی دەكەین ،جا هەروەكو ئەو زەوی و گیا مردوە زیندودەكەینەوە هەربەم شێوەیە ئێوەش لە گۆڕەكانتانەوە دەردەهێنرێن و جارێكی تر زیندو دەكرێنەوە بۆ حیساب و پاداشت و سزا، پێتان خۆش بێت یان نا.

﴿١٢﴾ خۆ ئەو زاتەی كە ئەم هەمو جوتانەی دروستكردوەو بەشێك لە كەشتی و چوار پێیانیشی دروستكردوە بۆتان تا سواریان ببن بۆ ئازو گویازو هاتوچۆ كردنتان.

﴿١٣﴾ ئەوانەمان ڕامكردوە بۆتان بۆ ئەوەی بتوانن بوەستن لەسەر پشتیان ، پاشان یادی چاكەی پەروەردگارتان بكەن هەر كاتێك بە تەواوی وەستان لەسەریان و بڵێن: پاك و بێ عەیبی بۆ ئەو زاتەی كە ئەمەی بۆ ڕامكردوین، خۆ ئێمە توانای ڕامكردنی ئەمانەمان نەبو ئەگەر ئەو زاتە رامی نەكردنایە بۆمان.

﴿١٤﴾ جا بێگومان ئێمە هەر بۆ لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. بەڕاستی ئەم شێوە سواربونە بەسەر وڵاخ و كەشتیەوە وەك هەڵگرتنمانە بە دارمەیت بۆ گۆڕستان و ئەوەمان دەخاتەوە بیر، لە فەرمودەداهاتوە كە مسلم و جگە لەویش هێناویانە كە پێغەمبەر ﷺ هەر كاتێك سواری وڵاخێكی سواری ببوایە سێ جار دەیفەرمو:{ الله أكبر، پاشان دەیفەرمو: ﴿ سُبْحَـٰنَ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَـٰذَا وَمَا كُنَّا لَهُۥ مُقْرِنِينَ وَإِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا لَمُنقَلِبُونَ ﴾ پاشان دەیفەرمو: اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنْ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ

فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ وَالْأَهْلِ وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ وَزَادَ فِيهِنَّ آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ/ئەی پەروەردگارم داوای چاکەو تەقوات لێدەکەم لەم سەفەرمداو لە کرداریش ئەوەی کە ڕازیبی لێی، ئەی پەروەردگارم ئەم سەفەرەمان لەسەر ئاسان بکەو جێگا دورەکانمان بۆ نزیك بکەرەوە، ئەی پەروەردگارم هەر خۆتیت هاوڕێ لەم سەفەرەداو جێ نشینی لە کەس‌و کارو خانەوادەمدا ئەی پەروەردگارم پارمەتی دەرمان بە لەم سەفەرەمانداو جێ نشینمانبە لەناو خاوخێزانماندا، ئەی پەروەردگارم پەنادەگرم بەتۆ لەسەختی سەفەرو لەدیمەنی خەمۆکیی‌و لەخراپی گەڕانەوە بۆ ناو ماڵ‌و کەسوکار. جا هەر کاتێکیش دەگەڕایەوە بۆلای خاو خێزانی‌و چاوی دەکەوت بە شارەکەی ئەو وشانەی دەفەرموو ئەمەیشی لێ زیاد دەکرد: دەگەڕێینەوەو تەوبە دەکەین إن شَاءَ الله ، بەردەوامین لەسەر بەندایەتی، هەر بۆ پەروەردگاریشمان سوپاسگوزارین} .

(١٥) جا هەر لە بەندەکانی خۆی هەندێکیان دەکرد بە هاوبەشی ﷲ، بێگومان مرۆڤ بە ئاشکرا زۆر سپڵەو نمەك نەناسە. بەڵێ، ئەوان بۆ خۆیان مێینەیان لا پەست بو نێرینەیان لەلا چاك بو کە چی بۆ خوا بە پێچەوانەوە ڕەفتاریان دەکرد بۆیە ﷲ بە دەمیاندا دەداتو دەفەرموێ:

(١٦) ئایا لە ئەوەی کە دروستی دەکات کچان بۆ خۆی هەڵدەبژێرێت‌و کوڕان بە ئێوە دەدات؟! دەی جا هیچ مرۆڤێکی ژیر ئاوا بڕیارێك دەدات؟

(١٧) خۆ هەر کاتێکیش بە یەکێك لە ئەوان مژدە بدرێت بەوەی کە بۆ ڕەحمانی بە نمونە دێننەوە کە کچە، لە داخ‌و خەمدا دەم‌و چاوی ڕەش هەڵدەگەڕێت‌و پینگ دەخواتەوەو بیر دەکاتەوە کە چی لەو کچە بکات؟ بیهێڵێتەوە بەشەرمەزاری یان زیندەبەچاڵی بکات؟

(١٨) ئایا ئەو کەسەی کە لەناو خشڵدا پەروەردە کرا بێت‌و لە کێشەو دەمەقاڵەدا توانای بە جوانی ڕۆشنکردنەوەی مەبەستەکانی خۆی نەبێت، ئا ئەوە دادەنێن بە منداڵی ﷲ؟! ئای چەند گێل‌و نەفامن.

(١٩) ئەو فریشتانەی کە بەندەی ڕەحمانن بە مێینەیان دادەنێن، ئایا لەوێ بون لە کاتی دروستکردنیان؟! دەی چۆن بڕیاری وادەدەن، ئەوسا ئەم شایەتیە ناحەقەیان هەر بەزوی تۆمار دەکرێت‌و لێیشیان پرسیار دەکرێت‌و هەروا بەخۆڕای لەسەریان ناچێت.

وَكَذَٰلِكَ مَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ فِي قَرۡيَةٖ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتۡرَفُوهَآ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّقۡتَدُونَ ﴿٢٣﴾ ۞ قَٰلَ أَوَلَوۡ جِئۡتُكُم بِأَهۡدَىٰ مِمَّا وَجَدتُّمۡ عَلَيۡهِ ءَابَآءَكُمۡۖ قَالُوٓاْ إِنَّا بِمَآ أُرۡسِلۡتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٢٤﴾ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٢٥﴾ وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ﴿٢٦﴾ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ ﴿٢٧﴾ وَجَعَلَهَا كَلِمَةَۢ بَاقِيَةٗ فِي عَقِبِهِۦ لَعَلَّهُمۡ يَرۡجِعُونَ ﴿٢٨﴾ بَلۡ مَتَّعۡتُ هَٰٓؤُلَآءِ وَءَابَآءَهُمۡ حَتَّىٰ جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ وَرَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿٢٩﴾ وَلَمَّا جَآءَهُمُ ٱلۡحَقُّ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ وَإِنَّا بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٣٠﴾ وَقَالُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانُ عَلَىٰ رَجُلٖ مِّنَ ٱلۡقَرۡيَتَيۡنِ عَظِيمٍ ﴿٣١﴾ أَهُمۡ يَقۡسِمُونَ رَحۡمَتَ رَبِّكَۚ نَحۡنُ قَسَمۡنَا بَيۡنَهُم مَّعِيشَتَهُمۡ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَرَفَعۡنَا بَعۡضَهُمۡ فَوۡقَ بَعۡضٖ دَرَجَٰتٖ لِّيَتَّخِذَ بَعۡضُهُم بَعۡضٗا سُخۡرِيّٗاۗ وَرَحۡمَتُ رَبِّكَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ﴿٣٢﴾ وَلَوۡلَآ أَن يَكُونَ ٱلنَّاسُ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ لَّجَعَلۡنَا لِمَن يَكۡفُرُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ لِبُيُوتِهِمۡ سُقُفٗا مِّن فِضَّةٖ وَمَعَارِجَ عَلَيۡهَا يَظۡهَرُونَ ﴿٣٣﴾

(٢٠) خۆ دەشڵێن: ئەگەر ڕەحمان ئارەزۆی لێ بووایە ئەوانەمان نە دەپەرستن، ئەوان لەو بارەوە هیچ زانیاریەکیان نیە، بەڵکو ئەوان هەر لە خۆوەو بە خەملاندن ئەم بڕیارانە دەدەن‌و درۆ هەڵدەبەستن. بەڵێ خوا نەناسان دەیانەوێ بڵێن: ئێمە تاوانبار نین لەم پەرستنەدا، چونکە ئەگەر خوا مەیلی لەپەرستنیان نەبوایە ماوەی بەئێمە نەدەدا، وەڵامی ئەم جۆرە کەسانە یەك زللەیە لەبن گوێیان، جا ئەو کاتە دەزانن کە ئایا مافی لێپرسینەوە هەیە یان نە ، خۆ ئەگەر ئەوان بێدەنگ دەبن‌و وەڵامی زللە وەشێن نادەنەوەو دەڵێن خوا مەیلی لێبوە ، بۆیە ئەو زللەیەی لێداوم ، ئەم ڕەخنەیان ڕێی تێدەچێت، ئەگینا با خۆیان بۆ تۆڵە ئامادە بکەن، چونکە مرۆڤ خۆی سەر پشك کراوە لە هەڵبژاردن.

(٢١) ئایا ئێمە پێش ئەم قورئانە پەڕاوێکمان بەوان داوە، جا ئەوان دەست بەو پەڕاوە بگرن‌و بیکەن بە بەڵگە لەسەرڕاستی‌و دروستی قسەو کردارە ناپەسەندەکانیان؟

(٢٢) نەخێر شتی وایان لانیە، بەڵکو دەڵێن: باوباپیرانمان لەسەر ئایینێك بونو بێگومان ئێمەش بەشوێن پێی ئەواندا دەڕۆین، ئیتر گوێیان لەوەنیە کەراستبێ یان ناڕاست.

(٢٣) جا هەر بەم شێوەیە بوە کە هیچ ترسێنەرێکمان نەناردوە پێش تۆ بۆ سەر هیچ گوندێك کە ئەو خەڵکە بترسێنێت لە

وَلِبُيُوتِهِمۡ أَبۡوَٰبٗا وَسُرُرًا عَلَيۡهَا يَتَّكِـُٔونَ ﴿٣٤﴾ وَزُخۡرُفٗاۚ وَإِن كُلُّ ذَٰلِكَ لَمَّا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَاۚ وَٱلۡأٓخِرَةُ عِندَ رَبِّكَ لِلۡمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾ وَمَن يَعۡشُ عَن ذِكۡرِ ٱلرَّحۡمَٰنِ نُقَيِّضۡ لَهُۥ شَيۡطَٰنٗا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٞ ﴿٣٦﴾ وَإِنَّهُمۡ لَيَصُدُّونَهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ﴿٣٧﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ ﴿٣٨﴾ وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ ﴿٣٩﴾ أَفَأَنتَ تُسۡمِعُ ٱلصُّمَّ أَوۡ تَهۡدِي ٱلۡعُمۡيَ وَمَن كَانَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٤٠﴾ فَإِمَّا نَذۡهَبَنَّ بِكَ فَإِنَّا مِنۡهُم مُّنتَقِمُونَ ﴿٤١﴾ أَوۡ نُرِيَنَّكَ ٱلَّذِي وَعَدۡنَٰهُمۡ فَإِنَّا عَلَيۡهِم مُّقۡتَدِرُونَ ﴿٤٢﴾ فَٱسۡتَمۡسِكۡ بِٱلَّذِيٓ أُوحِيَ إِلَيۡكَۖ إِنَّكَ عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٤٣﴾ وَإِنَّهُۥ لَذِكۡرٞ لَّكَ وَلِقَوۡمِكَۖ وَسَوۡفَ تُسۡـَٔلُونَ ﴿٤٤﴾ وَسۡـَٔلۡ مَنۡ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ مِن رُّسُلِنَآ أَجَعَلۡنَا مِن دُونِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ءَالِهَةٗ يُعۡبَدُونَ ﴿٤٥﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا مُوسَىٰ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَمَلَإِيْهِۦ فَقَالَ إِنِّي رَسُولُ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٦﴾ فَلَمَّا جَآءَهُم بِـَٔايَٰتِنَآ إِذَا هُم مِّنۡهَا يَضۡحَكُونَ ﴿٤٧﴾

تۆڵەی الله ئەگەر پەیڕەوی ڕاستی نەکەن ، مەگەر وتبێتیان بێگومان ئێمە لە باوباپیرانی خۆمان زانیومانە کە پەیڕەوی ئاینێك بوون‌و ئێمەش بێگومان هەر لەوان پەیڕەوی دەکەین‌و لێی لا نادەین‌و باوەڕیش بە کەسی تر ناکەین.

(٢٤) بڵێ: ئایا هەر ئەو پەیڕەویە کوێرانە هەڵدەبژێرن ، ئەگەر شتێکیشتان بۆ بهێنم چاکتربێت لەوەی باوباپیرانتان؟ دەڵێن: بێگومان ئێمە باوەڕمان نیە بەوەی کە تۆی بۆ ڕەوانە کراوەوبەراستی نازانین.

(٢٥) ئەوسا ئێمە تۆڵەمان لێ سەندن ، جا تەماشا بکەو بزانە سەر ئەنجامی بێباوەڕان چۆن بوە، واتە ئەم گەلەی تۆش ئەگەر باوەڕت پێنەکەن با بزانن کە هەمان سەر نویشت یەخەی ئەمانیش دەگرێت.

(٢٦) جاوەبیر بێنەرەوە ئەو کاتەی کە ئیبراهیم بە باوکی‌و بە گەلەکەی وت: بێگومان من بێزارم لەوەی کە ئێوە بەندایەتی بۆ دەکەن‌و بەراستی نازانم.

(٢٧) جگە لەو زاتەی کە دروستیکردوم ، جا بەڕاستی ئەو بەم زوانە ڕێنمایم دەکات بۆ دۆزینەوەی ڕێگای ڕاست، واتە پەیڕەوی جگە لەو زاتەی کە دروستیکردوم ناکەم کە ئەمە مانای (لا إله إلّا الله)یە.

(٢٨) جا پەروەردگاریش ئەو قسەیەی کرد بە وشەیەك تا لەپاش ئەودا بمێنێتەوەواتە(لا إله إلّا الله) ، بەڵکو ئەوانیش لەو تاوانانەی کە پەرستنی جگە لە الله یە واز بهێنن‌و لەو سەرەڕۆییە بگەڕێنەوە بۆ سەر ڕێگای ڕاست.

(٢٩) بەڵکو من ژیانی خۆشم دا بەئەوان‌و بەباو باپیرانیان هەتا فەرمانی ڕاستودروستیان پێگەیشت‌و پێغەمبەرێکی ڕۆشنکەرەوەی ڕێگای را ست و ناڕاستیان هاتەلا.

(٣٠) بەلاّم کاتێك کەئەو ڕاستیە هاتە لایان‌و پێغەمبەر ﷺ ئایینی بۆ باسکردن‌و ڕاست‌و ناراستی بۆ جیا کردنەوەو قسەکانی کاری گەری بوو تێیاندا لەجیاتی بیرکردنەوە لە هەڵەی خۆیان وباوەڕهێنان، وتیان: ئەمە جادوەو بێگومان کە ئێمە بەو بێ باوەڕین.

(٣١) جا دەیان وت : ئەگەر ئەمە ڕاستە با ئەم پەیامە بۆ یەکێك لەودوو پیاوە گەورەی ئەم دوو شارە بهاتایە ، واتە : شاری مەکەو تائیف‌و ئەو دوو پیاوەش مەبەستیان وەلیدی کوڕی موغیرە بو لە مەکەو عوروەی کوڕی مەسعودی سەقەفی بو لە تائیف کە دوو پیاوی گەورەو ناسراوی ئەو سەردەمەی هاتنی پێغەمبەر ﷺ بون. جاالله بەرپەرچیان دەداتەوەو دەفەرموێ:

(٣٢) ئایا ئەوان ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆ دابەش دەکەن‌و بە دەست ئەوانە ئەودابەش کردنە؟ هەر ئێمەین کە لە ژیانی دنیادا بژێویمان لە نێوانیاندا بەشکردوەو هەندێکیانمان چەندین پلە بەرز کردوەتەوە لە ماڵ‌و دەسەڵاتدا بەسەر هەندێکیاندا، تا هەندێکیان بەکاربهێنن لە ئیش‌و کاردا. لە ڕاستیدا ئەگەر هەمویان یەکسان بوونایە کاروباری ئەم ژیانە بە تەواوی تێك دەچو، پێویستە ئەوەش بزانین کە پەروەردگاری دانا وای کردوە کە هەمو مرۆڤێك لە هەر ئاستێکدا بێت پێویستی بە کەسی تر هەیە، بۆ نمونە ئەگەر سەرۆکی وڵاتانیش بێت پێویستی بە کەسانێك هەیە کە کەرەسەکانی ژیان دروست دەکەن لەدەرزی خەیاتیەوە بگرە تا سەیارەو فڕۆکە لە دروستکردنی بلۆکێکەوە تا بینا بەرزولە هەوردەرەکان پێویستی بەپسپۆڕو لێزان‌و ئەندازیارە هەتا کرێکارێکی سادەش، هەروەها باقی پێویستیەکانی تری، ئیتر کەسانی خواری ئەوویش تەماشا بکەو دەبینی مرۆڤ بە تەنها هەرگیز ناتوانێت تەواوی پێویستی‌و نیازو خۆشیەکانی ئەم دنیایەی خۆی دابین بکات، ئاشکرایشە لە ڕوانگەی ئاینەوە ئەو کەسەی کەخزمەتکارە گەورەی خەڵکە کەواتە با کرێکاران بزانن کەئەوان خاوەنی پلەیەکی گەورەن لەروانگەی ئایینی ئیسلامەوەو

ئەوان گەورەی خەڵكو زۆر بەڕێزیشن ، ئەوەتەپێشەوای مرۆڤایەتی كاتێ ﷺ چاوی بەدستی كرێكارێك دەكەوێت كەپێی شەرمە لەبەرزبری دەستی، تەوقە لەگەل پێغەمبەرﷺ دا بكات پێی دەفەرموێ:{ئەوە دەستێكە كە خواو پێغەمبەری خوا خۆشیان دەوێت } .

(٣٣)پەروەردگار ئەوەندە دنیای لەلا بێنرخە، دەفەرموێ: ئەگەر خەڵك هەموی یەك جۆر بێباوەڕو خوانەناس بونایە بەڕاستی ئێمە بۆ ئەو كەسانەی كە باوەڕیان بە رەحمان نیە بانی ماڵەكانیان لەڕووی ناوەوەیمان بۆ دەكردن بە زیو كە بەسەر پلەكانی زۆری زیوین دا سەردەبكەوتنایە بۆ خانوە بەرزەكانیان.

(٣٤) جا بۆ ماڵەكانیان دەرگایانێكو تەخت گەلێكی زیوینمان پێدەدان كە لەسەریاندا شان دابنێن.

(٣٥)ئەوسا لە زێڕیش هەروەها شتی هەمەڕەنگمان پێدەدان، جا ئەمانەی كە باسكران هەمویان جگە لە خۆشگوزەرانیەكی ژیانی دنیا شتێكی تر نین. ئەوسا خۆشیو شادمانی پاشەڕۆژ لەلای پەروەردگارت هەر بۆ پارێزكارانە.

(٣٦) جا ئەو كەسەی لە ڕاست یادكرنی رەحماندا خۆی نابینا دەكاتو پشتی لە ئایین دەكات، ئەوە شەیتانێكی بۆ ئامادە دەكەین ، ئەوسا ئەو دەبێت بە ڕەفیقیو چۆن خراپیێ بۆی ئاوای لێدەكاتو شەرمەندەی دنیاو دوارۆژی دەكات چونكە شەیتان دوژمنی مرۆڤە كە زاڵبو بەسەریا هەرچی خراپە پێی دەكاتو لەدوارۆژیشدا دەڵێ: بە گۆی منت نەكردایە بڕۆ سەرزەنشتی خۆت بكەو باسی من مەكە.

(٣٧)جا ئەو ڕەفیقانەیشیان بێگومان لە ڕێگای ڕاست لایان دەدەن كەچی وا گومانیش دەكەن كە هەر خۆیان ڕاستە ڕێگایان دیوەتەوەو خەڵكی ڕاست بە هەڵە دەزانن‌و گاڵتەیان پێدەكەن‌و دەیان ناوو ناتۆرەی نارەوایان پێدەڵێن: ساویلكە، توندڕەو، نەگونجاو، تۆقێنەر..و..هتد!

(٣٨)تا ئەو كاتەی كە دێتە لامان‌و خراپیو مایەی سەرشۆڕی خۆی بەهۆی ئەو رەفیقە خراپەیەوە دەبینێ كاتێ كە لە دنیادا بوە ، جا لەو كاتەدا بەو رەفیقەی دەڵێت: خۆزگە نێوان من‌و نێوان تۆ بە ئەندازەی دوری ڕۆژهەڵاتو ڕۆژئاوا بووایە، ئای چ خراپ برادەرو ڕەفیقێك بوی بۆم كەئاوا منت دوچاری ئەم ڕۆژە ڕەشە كرد، جا ئەو كاتە دەزانێ ڕاستو ناڕاست كامەیە ، بەڵام تازە ئەوزانینەی بێسودە.

(٣٩) جا پێیان دەوترێت: ئیتر هەرگیز ئەم ئاواتو خەم‌و بێزارییەتان لەم ڕۆژەدا سودێكتان پێنادات ، چونكە بێگومان ئێوە لە دنیادا ستەمتان لە خۆتان كردوە چونكە باوەڕتان نەهێناوەو ستەمیشتا لە خەڵكی تر كردوە كە سەرتان لێتێكداون بە هۆی قسەی پڕوپوچ وبێنرخو ڕاگەیاندن‌و بڵاوكراوەكانتانەوە لەبەرئەوە ئەمڕۆ هەموتان هاوبەشن لەم سزایەدا، ئینجا پەروەردگار دڵنەوایی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەكاتو دەفەرموێ:

(٤٠)ئایا تۆ دەتوانیت بەمرۆڤی كەڕ شت ببیسێنی یان كوێر ڕێنمایی ڕێگای ڕاستی بكەیتو بیانگەیەنیت بەخۆشی بەهەشتی هەتاهەتای؟ وە ئایا تۆ دەتوانیت ئەو كەسەی كە كەوتوەتە ناو گومڕاییەكی ڕونەوە ڕێنمایی بكەیتو بیخەیتە سەر ڕاستە ڕێگا؟واتە تۆ ئەو ئەركەت لەسەر نیە بەڵكو تەنها گەیاندنی ئەو پەیامەت لەسەرە كە بۆمان ناردویت .

(٤١) جا ئەگەر ئێمە تۆیش ببەینەوەو بمریت خۆ ئەوان پشتگوێ ناخرێن، ئەوسا بەبێگومان ئێمە تۆڵە لەوان وەردەگرین.

(٤٢)یان ئەگەر ئەوەی كە بەڵێنمان داوە بەوان لە سزا لەسەردەمی ژیانی تۆیشدابێت ئەوسا بەڕاستی ئێمە دەسەڵاتمان هەیە بەسەریانداودەتوانین ئەوە بكەین‌و ئەوان ناتوانن لەو سزایە خۆیان ڕزگار بكەن.

(٤٣)جا تۆ دەست بگرە بەوەی كە ناردومانە لات كە قورئانەو بێباكانە رایگەیەنە بەوان كە بێگومان تۆ لەسەر ڕێگای ڕاستی.

(٤٤)خۆ بێگومان كە ئەم قورئانە مایەی شەرەفو ڕێزە بۆ خۆتو بۆ نەتەوەكەت، وەبەم زوانەش كۆچ دەكەن و دێنەوە بەردەستمان‌و لەو بارەوە پرسیارتان لێدەكرێت كە چۆن جوڵانەوە لەگەل ئەم قورئانەداو چیتان لەگەل پێغەمبەرداﷺ كرد؟

(٤٥)جا لەو خەڵكە لەبارەی پێغەمبەرانێ كەلە پێش تۆدا ناردومانە بپرسە ئایا ئێمە جگە لە رەحمان پەرستراوێكی ترمان داناوە كە خەڵك بیپەرستێت؟ واتە: پێغەمبەرانمان تەنها بەوە ڕەوانە كردوە كە تۆ باسی دەكەیت بۆیان، كە تەنها ﷲ بپەرستن‌و جگە لەو كەسی تر نەپەرستن.

(٤٦) خۆ بە راستی موسامان(عليه السلام) بە نیشانەكانی خۆمانەوە ڕەوانەی لای فیرعەون‌و پیاو ماقوڵانی گەلەكەی كرد، جا وتی: بەڕاستی من نێردراوی پەروەردگاری جیهانیانم‌و بانگی كردن بۆ

وَمَا نُرِيهِم مِّنْ ءَايَةٍ إِلَّا هِىَ أَكْبَرُ مِنْ أُخْتِهَا ۖ وَأَخَذْنَٰهُم بِٱلْعَذَابِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤٨﴾ وَقَالُوا۟ يَٰٓأَيُّهَ ٱلسَّاحِرُ ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ إِنَّنَا لَمُهْتَدُونَ ﴿٤٩﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلْعَذَابَ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿٥٠﴾ وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِى قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِى مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِى مِن تَحْتِىٓ ۖ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾ أَمْ أَنَا۠ خَيْرٌ مِّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ مَهِينٌ وَلَا يَكَادُ يُبِينُ ﴿٥٢﴾ فَلَوْلَآ أُلْقِىَ عَلَيْهِ أَسْوِرَةٌ مِّن ذَهَبٍ أَوْ جَآءَ مَعَهُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ مُقْتَرِنِينَ ﴿٥٣﴾ فَٱسْتَخَفَّ قَوْمَهُۥ فَأَطَاعُوهُ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٥٤﴾ فَلَمَّآ ءَاسَفُونَا ٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَٰهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٥﴾ فَجَعَلْنَٰهُمْ سَلَفًا وَمَثَلًا لِّلْءَاخِرِينَ ﴿٥٦﴾ ۞ وَلَمَّا ضُرِبَ ٱبْنُ مَرْيَمَ مَثَلًا إِذَا قَوْمُكَ مِنْهُ يَصِدُّونَ ﴿٥٧﴾ وَقَالُوٓا۟ ءَأَٰلِهَتُنَا خَيْرٌ أَمْ هُوَ ۚ مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًۢا ۚ بَلْ هُمْ قَوْمٌ خَصِمُونَ ﴿٥٨﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا عَبْدٌ أَنْعَمْنَا عَلَيْهِ وَجَعَلْنَٰهُ مَثَلًا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ وَلَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَا مِنكُم مَّلَٰٓئِكَةً فِى ٱلْأَرْضِ يَخْلُفُونَ ﴿٦٠﴾

یەکخواپەرستیو عەساکەیو سپیەتی ناودەستی دوو ئایەتی گەورەبون کە پیشانی فیرعەونو کەسانی دەوروبەری دا.

﴿٤٧﴾ جا کاتێك کە بە نیشانەکانی ئێمە هاتە لایان وەکو عەساو دەستەکەی کەچی ئەوان هەر زوو بەو نیشانانە پێدەکەنینو بە گاڵتەوە تەماشایان دەکردن، بۆیە پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٤٨﴾ خۆ ئێمە هیچ نیشانەیەکمان بەوان نیشان نەدەدا مەگەر ئەوەیان گەورەتر بێت لە پێشیان، جا ئێمە بەو سزا سەختانە تۆڵەمان لێ سەندن بەڵکو لەو خوانەناسیە بگەڕێنەوە، جا ئەوان لە جیاتی گەڕانەوە بەڵکو تا دەهات زیاتر دژایەتی موسایانﷺ دەکرد.

﴿٤٩﴾ ئیتر خوا هەر جارێ بە جۆرێك لەسزا تۆڵەی دەدان، جا لەو کاتەدا دەیان وت: ئەی جادوگەر داوا بکە لە پەروەردگارت بەو بەڵێنەی کە داوێتی پێت، با ئەم سزایەمان لەسەر لابات، بەڕاستی ئیتر ئێمە ڕێگای ڕاستەقینە دەگرینو فەرمانت ناشکێنین.

﴿٥٠﴾ جا هەرکە ئەو سزایەمان لەسەرلا بردنایە کتوپڕ بەڵێنەکانی خۆیان دەشکاندو دژایەتی موساﷺو ڕێبازەکەیان دەکرد.

﴿٥١﴾ جا فیرعەون بانگی گەلەکەی کردو وتی: ئەی گەلی من ئایا وڵاتی میسرو ئەو ڕوبارانەی کە بە بەردەمی مندا دەڕۆن موڵکی من نیە؟ ئایا خۆتان ئەمە نابینن؟

﴿٥٢﴾ دەی ئایا من چاکترنیم لەو کەسەی کە لاوازو سوکەو ناتوانێ بە باشیش قسەکانی خۆی بکات؟ دەڵێن: موسا ﷺ لەقسەکردندا زمانی دەگرتو بەباشی قسەی بۆ نەدەکرا، دەڵێن بەهۆی ئەوە بوە کە بە منداڵی دەمی لە پشکۆیەك داوە، جا فیرعەون ئەوەی بەعەیب دادەنا بۆیو خۆی بەخاوەن هێزو ئەوی بێنرخ تەماشا دەکردو دەیوت:

﴿٥٣﴾ سا با چەند دەست بەندێکی ئاڵتونی بۆ ڕەوانە بکرایە یان چەندین فریشتەی لەگەڵدا بوایە تا باوەڕمان پێبکردایە. بەڵێ دنیا پەرستان هەر بیر لە خواردنو ماڵو سامان دەکەنەوەو هەر ئەوەش بە پێوەری چاكو ناچاکی پیاوچاکان دادەنێن کە ئەوسەروەتوسامانە لە ڕوانگەی ئایینەوە تەنها بەڵگەی تاقی کردنەوەیەو هیچی تر.

﴿٥٤﴾ ئەوسا گەلەکەی خۆی سوك کرد جا ئەوانیش لە ترسا پەیڕەوییان کرد بێگومان کە ئەوان گەلێکبون لە ترسی فیرعەون بیریان لە ڕاستی موساﷺو موعجیزەکانی نەدەکردەوەو بەمکارەیان لەدژایەتی خودا لە سنور دەرچو بون.خوا دەفەرموێ:

﴿٥٥﴾ جا کاتێك کە ئێمەیان ڕق هەستان تۆڵەمان لێ سەندنەوە، ئەوسا لەو ڕوبارەی کە پێوەی دەنازی هەر هەموویانمان خنکاند. فیرعەونو گەلەکەی بۆ هەمیشە بەرەو دۆزەخ بەڕێکرانو موساﷺو گەلەکەی لەشەڕی ئەو خراپەکارانە بۆ هەمیشە ڕزگاریان بو.

﴿٥٦﴾ ئەوسا کردنمان بە پێشینەو نمونە بۆخەڵکی پاش خۆیان ، تا خەڵکی پاش خۆیان لەوان ئامۆژگاری بگرنو خۆیان لەدژایەتی خواو ئایینەکەی دوربگرن تا دوچاری سەرنویشتی خراپی وەك ئەوان نەبن.

﴿٥٧﴾ خۆ لە کاتێکدا کە کوڕی مەریەم بە نمونە هێنرایەوە لەو کاتەدا گەلەکەت بەوە پێدەکەنینو پێیان وابو کە بەمە بەهانەیەکی باشو بەهێزیان پەیداکردوە بۆ دژایەتی تۆ کە گوایە: ئەگەر محمد ﷺ دەڵێت هەرچی پەرستراو هەیە جگە لە ﷲ هەموی تاغوتەو خۆراکی دۆزەخن خۆ عیسایش هەندێ لە بەناو مەسیحیەکان دەیپەرستن، کەوابو یان محمد درۆ دەکات یان

وَإِنَّهُۥ لَعِلۡمٌ لِّلسَّاعَةِ فَلَا تَمۡتَرُنَّ بِهَا وَٱتَّبِعُونِۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ ﴿٦١﴾ وَلَا يَصُدَّنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُۖ إِنَّهُۥ لَكُمۡ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿٦٢﴾ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالَ قَدۡ جِئۡتُكُم بِٱلۡحِكۡمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعۡضَ ٱلَّذِي تَخۡتَلِفُونَ فِيهِۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّي وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ فَٱخۡتَلَفَ ٱلۡأَحۡزَابُ مِنۢ بَيۡنِهِمۡۖ فَوَيۡلٌ لِّلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمٍ أَلِيمٍ ﴿٦٥﴾ هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةً وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٦٦﴾ ٱلۡأَخِلَّآءُ يَوۡمَئِذِۭ بَعۡضُهُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوۡفٌ عَلَيۡكُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَآ أَنتُمۡ تَحۡزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسۡلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ أَنتُمۡ وَأَزۡوَٰجُكُمۡ تُحۡبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيۡهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكۡوَابٍۖ وَفِيهَا مَا تَشۡتَهِيهِ ٱلۡأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلۡأَعۡيُنُۖ وَأَنتُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلۡكَ ٱلۡجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثۡتُمُوهَا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمۡ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنۡهَا تَأۡكُلُونَ ﴿٧٣﴾

عیسایش دۆزەخیە؟ بەم بەرداشتەی خۆیان پێدەکەنین‌و وایان دەزانی بەلگەیەکی گەورەیان دۆزیوەتەوە دژی پێغەمبەرﷺ.

﴿٥٨﴾ جا وتیان: ئایا خوداکانی ئێمە چاکە یان عیسا؟ ئەم وێنەیە بۆ تۆ باس ناکەن مەگەر هەر بۆ دەمەقالەو مشتومڕ نەك تەنها ئەوە، بەڵکو ئەوان گەلێکی چەنەبازو شەڕفرۆشن. پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:{مَا ضَلَّ قَوْمٌ بَعْدَ هُدًى كَانُوا عَلَيْهِ إِلَّا أُوتُوا الْجَدَلَ ثُمَّ تَلَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هَذِهِ الْآيَةَ ﴿مَا ضَرَبُوهُ لَكَ إِلَّا جَدَلًاۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٌ خَصِمُونَ﴾ /الترمذي، صححه الالباني/ هیچ گەلێك پاش ڕێنمونی‌و گەیشتن بەرێگای ڕاست گومڕا نەبوون هەتا دەستیان کردوە بەدەمەدەمەو مشتو مڕ لە بارەی ئایینەوە، پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿مَا ضَرَبُوهُ ...الاية﴾}

﴿٥٩﴾ جاخوا بەرووياندا دەداتەوەودەفەرموێ: ئەو هەر بەندەیەکە لە بەندەکانمان‌و تەوحیدو یەکخواپەرستی بە گەلەکەی وتوەو دژی پەرستنی بێجگە لە ﷲ بوە ، چونکە ئێمە نیعمەتی گەورەی خۆمان کە پێغەمبەرایەتیە بەودابو، جا لە رۆژی قیامەتیشدا نەك سزا نادرێت بەڵکو دەنگی ئاگریش نابیسێت، وەکردمان بە نمونەیەکیش بۆ نەوەی یەعقوب ﷺ چونکە بەبێ باوك دروستمان کرد.

﴿٦٠﴾ خۆ ئەگەر ئارەزۆمان لێبوایە لەجیاتی ئێوە فریشتەکانمان دادەنا کە جێنشینی پێشویانی خۆیان بوونایە لەم سەر زەویەدا، واتە: ئێمە بێنیازین لە ئێوە ئەگەر بمانەوێت لاتان بەرین لاتان دەبەین نەشتێکی گرانە لەسەرمان‌و نە هیچ شتێك لە موڵکی ئێمەدا کەم دەبێتەوە. بەراستی ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە ئەگەر ژیری هەبێت بۆ هەمو مرۆڤە لاسارو سپڵەو خوانەناسەکان.

﴿٦١﴾ جا بەڕاستی عیسا (یان قورئان) یەکێکە لە نیشانەکانی قیامەت ئەوسا نەکەونە گومانەوە تێیدا ساتۆ ئەی محمد ﷺ بڵێ: پەیڕەوی لە من بکەن، چونکە هەر ئەمەیە ڕێگای ڕاست. پاش ڕاستیش هەمووی گومڕاهیە.

﴿٦٢﴾ سا با شەیتان ڕێگای ڕاستتان لێ نەگرێت‌و بە فیتی ئەو نەخەڵەتێن چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنێکی ئاشکراتانەو هیچ هەلێك بۆ فریودانتان لەدەست نادات‌ولەهیچ خراپەیەکیش سڵ ناکات.

﴿٦٣﴾ جا لەکاتێکدا کە عیسا بە بەڵگە گەلێکی ڕۆشنەوە هات، وتی: بە ڕاستی من بە داناییەوە هاتوم بۆ لاتان تا هەندێ لەوشتانەی کە ناڕێکن تێیدا بۆتان ڕوون بکەمەوە ، جا ئێوەش لە ﷲ بترسن‌و پەیڕەوی من بکەن، تا سەرفەرازو خۆشبەخت ببن.

﴿٦٤﴾ بێگومان ﷲ هەر خۆیەتی پەروەردگاری ئێوە سا ئێوەش ئەو بپەرستن، ئەمەیە ڕێگای ڕاست کە پەرستنی پەروەردگاری جیهانیانە بە تەنهایی‌و هیچ هاوبەشێکی بۆ دانەنرێت نە لەزاتیاو نە لە سیفاتیاو نە لەکرداریدا.

﴿٦٥﴾ جا ئەو کۆمەڵانە، واتە: گاورو جولەکە لەنێوان خۆیاندا ناڕێکیان تێکەوت تەنانەت گاورەکان بوون بەچوار بەشەوە: نەستوری کەعیسا بە کوڕی خوا دەزنن، مەلکییە کە بە خوای سێهەمی دەزانن، ویەعقوبی کە هەر ئەو بەخوا دەزانن، هەندێکیشیان یەکخواپەرستی چاك بون، جا وای بۆ ئەو کەسانەی کە ستەمیان کردوە لە سزای بەژانی ئەو ڕۆژەی کە پێی دەگەن کەرۆژی زیندوبونەوەو حیسابە، پاشان پردی سیرات‌و ئاگری دۆزەخە.

﴿٦٦﴾ ئایا جگە لە هاتنی ڕۆژی قیامەت کە بە کتوپڕی بدات بەسەریانداو ئەوان هەست بەهیچ نەکەن چاوەڕوانی چی تر دەکەن؟ جا ئەو کاتە بە تەواوی پەشیمان دەبنەوە بەڵام ئەو پەشیمان بوونەوە لەو کاتەدا هیچ سودێکیان پێناگەیەنێ.

إِنَّ ٱلْمُجْرِمِينَ فِى عَذَابِ جَهَنَّمَ خَٰلِدُونَ ﴿٧٤﴾ لَا يُفَتَّرُ عَنْهُمْ وَهُمْ فِيهِ مُبْلِسُونَ ﴿٧٥﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا۟ هُمُ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٧٦﴾ وَنَادَوْا۟ يَٰمَٰلِكُ لِيَقْضِ عَلَيْنَا رَبُّكَ ۖ قَالَ إِنَّكُم مَّٰكِثُونَ ﴿٧٧﴾ لَقَدْ جِئْنَٰكُم بِٱلْحَقِّ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَكُمْ لِلْحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٨﴾ أَمْ أَبْرَمُوٓا۟ أَمْرًا فَإِنَّا مُبْرِمُونَ ﴿٧٩﴾ أَمْ يَحْسَبُونَ أَنَّا لَا نَسْمَعُ سِرَّهُمْ وَنَجْوَىٰهُم ۚ بَلَىٰ وَرُسُلُنَا لَدَيْهِمْ يَكْتُبُونَ ﴿٨٠﴾ قُلْ إِن كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدٌ فَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْعَٰبِدِينَ ﴿٨١﴾ سُبْحَٰنَ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَرْشِ عَمَّا يَصِفُونَ ﴿٨٢﴾ فَذَرْهُمْ يَخُوضُوا۟ وَيَلْعَبُوا۟ حَتَّىٰ يُلَٰقُوا۟ يَوْمَهُمُ ٱلَّذِى يُوعَدُونَ ﴿٨٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِى فِى ٱلسَّمَآءِ إِلَٰهٌ وَفِى ٱلْأَرْضِ إِلَٰهٌ ۚ وَهُوَ ٱلْحَكِيمُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٨٤﴾ وَتَبَارَكَ ٱلَّذِى لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَعِندَهُۥ عِلْمُ ٱلسَّاعَةِ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٨٥﴾ وَلَا يَمْلِكُ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿٨٦﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَهُمْ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ ۖ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٨٧﴾ وَقِيلِهِۦ يَٰرَبِّ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾ فَٱصْفَحْ عَنْهُمْ وَقُلْ سَلَٰمٌ ۚ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾

﴿٦٧﴾ ئەو ڕۆژە دۆستەكان هەندێكیان دوژمنی هەندێكیانن‌و هەریەكەیان ئەوی تریان تاوانباردەكاتو داوای سزای توند بۆ یەكتر دەكەن‌و جنێو بە یەكتر دەدەن جگە لە پارێزكاران كە لەوێ دۆستایەتیەكانیان خۆشترو بەتامترەوە پاش دەرچونی فەرمانی شەفاعەتكردن بە هانای یەكترەوە دێن‌و تكا بۆ یەكتریش دەكەن‌و دەبنە هۆی ڕزگار كردنی یەكتر لەئاگری دۆزەخ. جا لەوڕۆژەدا پەروەردگار بانگ دەكاتو دەفەرموێ:

﴿٦٨﴾ ئەی بەندە ڕاستەكانم ئەمڕۆ هیچ مەترسیەك بۆ ئێوە نیەو ئێوە ئیتر خەم ناخۆن‌و دڵتەنگ نابن بەهۆی ئەو هەمو چاكەیە كە لەگەڵتان دەكرێت لەلایەن منەوە. جائەو بەندە ڕێز لێگیراوانەمان بۆباسدەكاتو دەفەرموێ:

﴿٦٩﴾ ئەو كەسانەن كە باوەڕیان هێناوە بەتاكو تەنهایی خواو پەیڕەوی پێغەمبەرو ئایینی خۆیان كردووەو بە چاكی گەردنكەچی فەرمانەكانی ﷲ بوون. جا پێیان دەوترێت:

﴿٧٠﴾ خۆتان‌و هاوسەرەكانتان بچنە ناو ئەو سەیرانگای بەهەشتەوەوبۆ خۆتان خۆش ڕابوێرن.

﴿٧١﴾ كە قاپە زێڕینەكانی پڕ لە میوە بەناویاندا دەخولێنرنەوەو ئەوەش كەئارەزۆیان لێبێت‌و چاوەكانیان پێی گەش‌و شادمان بێت لەوێدا هەیە بۆیان، ئەوسا ئێوە لەناو ئەو نازو نیعمەتەیشدا بۆ هەمیشەدەمێننەوە، جا پەروەردگار بۆ زیاتر دڵخۆشكردنیان پێیان دەفەرموێ:

﴿٧٢﴾ ئەوە ئەو بەهەشتەیە كە بەهۆی كارو تەلاشی خۆتانەوە بە كەلەپور پێمداون، پێغەمبەری ﷺ خوا دەفەرموێ: { يُنَادِي مُنَادٍ إِنَّ لَكُمْ أَنْ تَحْيَوْا فَلَا تَمُوتُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَصِحُّوا فَلَا تَسْقَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَشِبُّوا فَلَا تَهْرَمُوا أَبَدًا وَإِنَّ لَكُمْ أَنْ تَنْعَمُوا فَلَا تَبْأَسُوا أَبَدًا فَذَلِكَ قَوْلُهُ تَعَالَى وَتِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ/الترمذي وصححه الالباني/ جارچیەك جاڕ دەدات كە: بێگومان دەژین ئەوسا ئیتر نامرن، جا بێگومان ساق‌و سەلیم دەبن‌و ئیتر هەرگیز نخۆش ناكەون، وەبێگومان كە گەنج دەبنەوەو هەرگیز پیر نابن، خۆبێگومان كە لە كەیف‌و خۆشیدا دەبن ، سا ئیتر بۆ هەمیشە كەمدەست ونائومێد نابن، جا ئا ئەمەیە مانای فەرمودەی خوای باڵادەست:﴿ئەوە ئەو بەهەشتەیە كە بەهۆی كارو تەلاشی خۆتانەوە بە كەلەپور پێمداون ﴾}

﴿٧٣﴾ كە لەناویدا میوەی زۆرتان بۆ هەیەو لەو دەخۆن بەبێ بێتاقەت بون‌و بەبێ بڕانەوەی میوەكان، بەڵێ خواردن‌و خواردنەوەو باسی میوەكانیشی بۆ كردین تا زیاتر ئارەزۆی بكەین‌و چاك بۆی هەوڵ بدەین، لەفەرمودەدا هاتوەكە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ إِنَّ أَهْلَ الْجَنَّةِ يَأْكُلُونَ فِيهَا وَيَشْرَبُونَ وَلَا يَتْفُلُونَ وَلَا يَبُولُونَ وَلَا يَتَغَوَّطُونَ وَلَا يَمْتَخِطُونَ قَالُوا فَمَا بَالُ الطَّعَامِ قَالَ جُشَاءٌ وَرَشْحٌ كَرَشْحِ الْمِسْكِ يُلْهَمُونَ التَّسْبِيحَ وَالتَّحْمِيدَ كَمَا تُلْهَمُونَ النَّفَسَ / مسلم/ بێگومان خەڵكی بەهەشتی بە ئارەزۆی خۆیان دەخۆن‌و دەخۆنەوە ، جا نەتف ئەكەن‌و نەمیزو نەپیسی‌و نەچڵمیان هەیە.وتیان: ئەی ئەو خواردنە چی لێدێت؟ فەرموی: قرپێنەیەو ئارەقێكە بۆنی وەكو میسكەو سبحان اللەوالحمدللەو اللەاكبر، ئەخرێتە ناو دڵیانەوەو هەر ئەوە دەڵێنەوە- لەریوایەتێكی ترداهاتوە- كە ئەم زیكرانە وەكو هەناسەدانی لێدێت بۆیان‌و هەست بەماندوبون ناكەن} ئینجا باسی ستەمكاران‌و سزاكانیان دەكاتو دەفەرموێ:

﴿٧٤﴾ بێگومان ستەمكاران لەناو سزای دۆزەخدان بۆ هەمیشە.

﴿٧٥﴾ كە هەرگیز ئەوان سزایان لێ نابچڕێت، جا لەناویدا نائومێدن‌و هیچ دەرفەتێكیان نیە بۆ ڕزگاربون، جا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٧٦﴾ خۆ ئێمە هیچ ستەمێكمان لەوان نەكردوە بەڵكو ئەوان خۆیان ستەمیان لەخۆیان كردوە بەهەڵبژاردنی ڕێبازی هەڵەو دژی ئایین‌ودژی مرۆڤایەتی.

(٧٧)جا ئەوان لەوێدا ئەوەندە ئێش‌وئازاریان زۆرە بانگی دەرگاوانی دۆزەخ دەکەن‌و دەڵێن: ئەی مالك با پەروەردگارت بڕیارمان بەسەردا بداتو لەم ژینە خراپە دەرمان بکات .

(٧٨)جا ئەویش لەوەڵامیاندا دەڵێت: بێگومان هەر دەمێننەوە لێرەو دەرچونتان نیە، جا بۆیە ئەم کارە ساتەتان بەسەر هاتوە چونکە بەراستی ئێمە بەرنامەی ڕاست‌ودروستمان بۆ ناردون بەڵام زۆربەتان خۆشتان لە ڕاستی نەبو بەڵکو دژایەتیتان کرد جا وا ئەمڕۆ بە بەرهەمی کارە ناپەسەندەکانی خۆتان گەیشتون . ئینجا ئەمانهێنێتەوە بۆ دنیاودەفەرموێ:

(٧٩)بەڵکو ئەگەر ئەوان دەیانەوێت فڕوفێڵێکی بتەو و بەهێز دژی پێغەمبەر ﷺ و ئایینەکەی ئەنجام بدەن ، سا چاك بزانن کە ئێمەیش لەوان توندترو سەختتر ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکەین.

(٨٠)نەخێر، ئەوان وا دەزانن کە ئێمە شتە شاراوەکانیان‌و چپەکانیان نابیسین؟ وانیە، بۆچونەکەیان زۆر هەڵەیەو نێردراوەکانی ئێمە وان لەگەڵ ئەواندا‌و دەینوسن ئەو شتانەی کە دەیڵێن چ بە زمان دەری بخەن یان بیشارنەوە.

(٨١)ئەی محمدﷺ بڵێ: ئەگەر ڕەحمان منداڵی بوایە ئەوسا من یەکەم کەس دەبووم بۆ پەرستنی، چونکە من لەئێوە چاکتر خوا دەناسم‌و زیاتر لێی دەترسم ئاشکرایە کە منداڵی نیە کەواتە تەنها هەر زاتی خۆی دەپەرستم‌و ئێوەش بۆ ئەوە بانگ دەکەم. هەندێکیش وشەی{ إن }بەحەرفی نەفی دەزانن واتە، ڕەحمان کەزاتی ﷲ یە منالی نیەو من یەکەم کەسی خەڵکی مەکەم لەم سەردەمەدا کە ﷲ بەتاك‌و تەنهایی دەپەرستم.مانای تریش کراوەبەڵام من یەکەمیانم بەلاوەنزیکترە.

(٨٢)بێ عەیبی بۆ پەروەردگاری ئاسمانان‌و زەوی، پەروەردگاری عەرش لەو وەسفە ناڕەوایەی کە بۆ ﷲی دادەنێن‌و دەڵێن ﷲ منداڵی هەیە.

(٨٣) سا تۆ لێیان گەڕێ با هەر قسەی پڕوپوچ‌و گاڵتە بکەن تا ئەگەن بەو ڕۆژەیان کە بەڵێنیان پێدراوە، جا ئەو کاتە دەزانن کێ سەرکەوتوەو کێیش دۆڕاوە.

(٨٤)خۆ هەر ئەو زاتەیە کە شایستەی پەرستنە لە ئاسماندا، وە هەر ئەویشە شایستەی پەرستن لە زەویدا، خۆ هەر ئەوە دانایە لە کاروباریداو زۆر زانایە بە هەمو نیەت‌و قسەو کردارێك کەم یان زۆر، ئاشکرا یان شاراوەو هەمویشی تۆمار دەکرێت‌و هیچی لێ ون نابێت.

(٨٥) جا بێ عەیبەو خاوەنی خێری زۆرە ئەو زاتەی کە ئاسمانان‌و زەوی‌و ئەوەی کە لە نێوانیاندایە موڵکی ئەوە، ئەوسا زانینی کاتی هاتنی قیامەت تەنها لەلای ئەوەو کەسی تر هیچی لێ نازانێت‌و هەر بۆلای ئەو دەبرێنەوە.

(٨٦)خۆ ئەو کەسانەی کە جگە لەو دەیان پەرستن خاوەنی تکاو پاڵپشت نین بۆ کەس، مەگەر ئەو کەسەی بەڕاستی شایەتی دابێت‌و تبێتی (أشهَدُ أن لا إلَهَ إلَّا الله) و بە دڵیش باوەڕی پێی هەبوبێت ، ئەمانە پاش ڕەزامەندی ﷲ دەتوانن تکاو شەفاعەت بکەن وەکو عیساو عوزەیرو پێغەمبەرانی تریش (سەلامی خوایان لەسەر بێ)و پیاوچاکان‌و شەهیدان ئەگەر چی خەڵکی جاهیل‌و نەفامیش ئەوانە بپەرستن ، چونکە ئەوان تاوانێکییان نیە لەو بارەوەو لە پلەی ئەوان کەم نابێتەوە چونکە ئەوان خەڵکیان بۆ یەکخواپەرستی بانگ کردوەو لە پێناوی ئەوەشدا لە دنیا ئازار دراون.

(٨٧) جا ئەگەر لێیان بپرسیت، کە کێ دروستیکردون دەڵێن: ﷲ دەی چۆن لەو ڕاستیە لادراون؟

(٨٨)وەلەلای ﷲ یە قسەی پێغەمبەرەکەی کەدەیوت: ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەمانە گەلێکن کە باوەڕ ناهێنن بەم قورئانە، جا پەروەردگار بە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:

(٨٩)جا تۆ وازیان لێ بێنەو بڵێ: لە منەوە هەر ئاشتیو بێ زیانی بۆ ئێوە هەیەو بە خراپەی ئەوان وەڵامیان مەدەرەوە، بەم زوانە دەزانن چیان کردوە و بەرهەمی کردارو ڕەفتاری خۆیان وەردەگرن، دیارە ئەمە بەر لە فەرمانی جیهاد بوە، جا ئەگەر مەبەست خۆگرتن بێت لە شەڕ کردن لەگەڵیاندا ئەمە مەنسوخە بە ئایەتی فەرمان بەغەزاو شەڕ کردن‌و ئەگەر مەبەستیش وەڵام نەدانەوەی خراپە بە خراپە بێت ئەوە یەکێکە لە ڕەوشتە بەرزەکان‌و نەسخی تێدا نیە.

٤٤ سُورَةُ الدُّخَانِ ٥٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمۡرٗا مِّنۡ عِندِنَآۚ إِنَّا كُنَّا مُرۡسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴿٦﴾ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَآۖ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ ﴿٧﴾ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ رَبُّكُمۡ وَرَبُّ ءَابَآئِكُمُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٨﴾ بَلۡ هُمۡ فِي شَكّٖ يَلۡعَبُونَ ﴿٩﴾ فَٱرۡتَقِبۡ يَوۡمَ تَأۡتِي ٱلسَّمَآءُ بِدُخَانٖ مُّبِينٖ ﴿١٠﴾ يَغۡشَى ٱلنَّاسَۖ هَٰذَا عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١١﴾ رَّبَّنَا ٱكۡشِفۡ عَنَّا ٱلۡعَذَابَ إِنَّا مُؤۡمِنُونَ ﴿١٢﴾ أَنَّىٰ لَهُمُ ٱلذِّكۡرَىٰ وَقَدۡ جَآءَهُمۡ رَسُولٞ مُّبِينٞ ﴿١٣﴾ ثُمَّ تَوَلَّوۡاْ عَنۡهُ وَقَالُواْ مُعَلَّمٞ مَّجۡنُونٌ ﴿١٤﴾ إِنَّا كَاشِفُواْ ٱلۡعَذَابِ قَلِيلًاۚ إِنَّكُمۡ عَآئِدُونَ ﴿١٥﴾ يَوۡمَ نَبۡطِشُ ٱلۡبَطۡشَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰٓ إِنَّا مُنتَقِمُونَ ﴿١٦﴾ ۞ وَلَقَدۡ فَتَنَّا قَبۡلَهُمۡ قَوۡمَ فِرۡعَوۡنَ وَجَآءَهُمۡ رَسُولٞ كَرِيمٌ ﴿١٧﴾ أَنۡ أَدُّوٓاْ إِلَيَّ عِبَادَ ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُمۡ رَسُولٌ أَمِينٞ ﴿١٨﴾

## ٤٤ سورەتی دوخان ٥٩

سورەتی دوخان کە سورەتی چل‌وچوارهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، پەنجاو نۆ ئایەتە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستو سێ هەمەو پاش سورەتی (الزخرف ) و پێش (الجاثية) دابەزیوە.

بەناوی‌الله ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) حامیم. الله هەر خۆی دەزانێ مەبەست لەم دوو پیتە چیە.

(٢) سوێند بەم پەراوە کە قورئانەو ڕۆشنکەرەوەی حەڵاڵو حەرامو ڕاستو ناڕاستو چاکو خراپە.

(٣) بەبێگومان ئێمە ترسێنەری خراپەکارانین پێش ئەوەی کە بە دادگاو سزای ئێمە بگەن، بەڵکو بیر بکەنەوەو واز لە تاوانو خراپە بهێنن.

(٤) هەر لەو شەوەشدا هەمو بڕیارێکی بتەو کە ناگۆڕێت لەبارەی ژیانو مردنو رزقو ڕۆزییەوە لەلایەن اللهوە یان لە{لەوحولەحفوزەوە} ڕەوانەی لای فریشتەکانی مەئمور دەکرێت، ئەو شەوەش ئەگەر چی وتراوە پانزەی مانگی شەعبانە بەڵام ڕاستتر ئەوەیە کە شەوی قەدرە کە قورئانی تێدا ڕەوانە کراوەتە خوارەوە کە جیاکەرەوەی هەمو حەرامو حەڵاڵو ڕاستیو ناڕاستیەکە.

(٥) کە فەرمانێکی گەورەیە لەلایەن ئێمەوە بەڕاستی ئێمەین کە پێغەمبەرانمان ڕەوانە کردوەو تۆش ئەی محمد یەکێکی لەو پیغەمبەرانە، جا خەڵك پێی خۆش بێت یان نە، چونکە ئێمە خەڵکمان بۆ تاقیکردنەوە هێناوەتە ئەم دنیایەو لە تاقیکردنەوە چۆن دەرچو بەو شێوە لە قیامەتدا ڕەفتاریان لەگەڵدا دەکرێت.

(٦) ئەمە سۆزو میهرەبانیەکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ خەڵك بێگومان کە ئەو خۆی چاك قسان دەبیسێو زۆر زانایە بەسەر کاروباری خەڵکداو هیچ شتێك لەبازنەی زانیاری ئەو دەر ناچێت.

(٧) ئەگەر یەقینتان هەیە ئەو زاتە پەروەردگاری تەواوی ئاسمانانو زەویو ئەوەیەکە لەنێوانیاندایەو هەموی ئەو دروستیکردونو پەروەردەیان دەکات.

(٨) هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە جگە لەو زاتەی کە هەمو مردویەك زیندو دەکاتەوەو هەر خۆیشی دەیمرێنێ، پەروەردگارتانەو پەروەردگاری باو باپیرانی پێشویشتانە.

(٩) بەڵکو ئەوان لەم ئاییندا لە گوماندانو گاڵتە دەکەن بە پێغەمبەر ﷺ و پەیڕەوانیو بەرنامەکەی، جا خوا هەڕەشەیان لێدەکاتو دەفەرموێ:

(١٠) ئەوسا تۆ چاوەڕێی ڕۆژێك بە کە ئاسمان دوکەڵێکی ئاشکرای لێپەیدادەبێت.

(١١) کەخەڵکی دادەپۆشێ جا ئەو کاتە دەڵێن: ئەمە سزایەکی بەژانە.

(١٢) داوادەکەن لەخواودەڵێن: ئەی پەروەردگارمان ئەم سزایەمان لەسەر لابە بێگومان ئێمە باوەڕ دەکەین بەوەی کە پێغەمبەرەکەت ڕاست دەکات، لەعەبدوڵای کوڕی عەباسەوە هاتوە کەوتی: پێغەمبەری خوا کاتێ دی کە خەڵکی مەکە پشت لەخۆیو پەیامەکەی دەکەن فەرموی: { اللَّهُمَّ سَبْعٌ كَسَبْعِ يُوسُفَ فَأَخَذَتْهُمْ سَنَةٌ حَصَّتْ كُلَّ شَيْءٍ حَتَّى أَكَلُوا الْجُلُودَ وَالْمَيْتَةَ وَالْجِيَفَ وَيَنْظُرَ أَحَدُهُمْ إِلَى السَّمَاءِ فَيَرَى الدُّخَانَ مِنَ الْجُوعِ فَأَتَاهُ أَبُو سُفْيَانَ فَقَالَ يَا مُحَمَّدُ إِنَّكَ تَأْمُرُ بِطَاعَةِ اللَّهِ وَبِصِلَةِ الرَّحِمِ وَإِنَّ قَوْمَكَ قَدْ هَلَكُوا فَادْعُ اللَّهَ لَهُمْ قَالَ اللَّهُ تَعَالَى فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاءُ بِدُخَانٍ مُبِينٍ إِلَى قَوْلِهِ إِنَّكُمْ عَائِدُونَ يَوْمَ نَبْطِشُ الْبَطْشَةَ الْكُبْرَى إِنَّا مُنْتَقِمُونَ فَالْبَطْشَةُ

يَوْمَ بَدْرٍ وَقَدْ مَضَتْ الدُّخَانُ وَالْبَطْشَةُ وَاللِّزَامُ وَآيَةُ الرُّومِ/ البخاري/: خوایە حەوت ساڵ گرانی وەك گرانیەكانی سەردەمی یوسف علیەالسلام بدەیت بەسەر ئەم خەڵكەدا،جا خوا نزاكەی لێوەرگرتو ساڵە گرانیەكی وا گرتنی كە هەمو شتێكی لەناوبرد، تا وایان لێ هات كە لەبرسا پێستەكانو مردارەبوو كەلاشە بۆگەنیوەكانیان دەخوارد، جاهەركام لەوان تەماشای ئاسمانی بكردایە لەبرسا هەر دوكەڵی دەبینی، جا ئەبوسوفیان هات بۆلای پێغەمبەر ﷺ و وتی: ئەی محمد تۆ فەرمان بە بەندایەتی خواو بەتینكردنی پەیوەندی خزمایەتی دەدەیت لەحاڵێكدا خزمەكانت خەریكە لەناودەچن لەبەر ساڵەگرانی، جا داوا بكە لەخوا بۆیان بۆ نەمانی ئەو قاتوقریە، خوای بالادەست فەرموی:﴿ ئەوسا تۆ چاوەڕێی ڕۆژێك بە كە ئاسمان دووكەڵێكی ئاشكرای لێ پەیدادەبێت/هەتا/ بێگومان ئێمە ئەو سزایە كەمێك لادەبەین بەلام ئەوان بە بێگومان دەگەڕێنەوە سەر بەرنامە خراپەكەی پێشوی خۆیان. جا باس بكە بۆیان ئەو ڕۆژەی كە زللەی گەورەتریان لێ دەدەین بەبێگومان كەئێمە تۆڵەوەردەگرین﴾ كەبریتی بو لەناو چونی سەرانی قورەیش لەبەدردا، بەراستی دوكەڵو لێدانی گەورەو لیزامونیشانەی ڕۆم تێ پەڕین} جا پێیان دەوترێت:

(١٣) ئەو كاتە تازە چ سودێكی هەیە بیركردنەوە؟ وە بەراستی پێغەمبەرێك كە ڕۆشنكەرەوەی ڕاستو ناڕاستە هاتە لایانو پەیامی ﷲ ی پێگەیاندن.

(١٤) بەلام ئەوان نەك باوەڕیان پێ نەكرد، بەڵكو ئەوان پاش ئەو ڕۆشنكردنەوەیە پشتیان تێكردو وتیان: ئەمە فێركراوێكی شێتە. بەلام وا ئێستا سزا دەبینن دەڵێن: باوەڕمان هەیە؟! جا پەروەردگار دەفەرموێ:

(١٥) بێگومان ئێمە ئەو سزایە كەمێك لادەبەین، بەلام ئەوان بە بێگومان دیسان دەگەڕێنەوە سەر بەرنامە خراپەكەی خۆیان،

(١٦) جا باس بكە بۆیان ئەو ڕۆژەی كە زللەی گەورەتریان لێدەدەین. وەكو ڕۆژی بەدر كە حەفتا كەس لە سەرانی قورەیش كوژران لەوانە ئەبوجەهلو شەیبەو عوتبەو وەلیدو حەفتا كەسیشیان بە دیلی كەوتنە دەست پێغەمبەرەوە ﷺ كە لەپێشیشدا بە بێبارانیو گرانی ڕووبەڕوو بونەوە تا پاڕانەوە لە پێغەمبەر كە دوعایان بۆ بكات بۆ ئەوەی لەو سەختیە ڕزگاربن، پێغەمبەری میهرەبانو بەسۆزیش ﷺ پاڕاوە بۆیانو ئەو بێبارانیو گرانیە نەما لەناویاندا، بەلام هەروەكو پەروەردگار فەرموی: ئەوان دیسان دەستیان دایەوە دژایەتی پێغەمبەرﷺ و

وَأَن لَّا تَعْلُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ۖ إِنِّىٓ ءَاتِيكُم بِسُلْطَـٰنٍ مُّبِينٍ ﴿١٩﴾ وَإِنِّى عُذْتُ
بِرَبِّى وَرَبِّكُمْ أَن تَرْجُمُونِ ﴿٢٠﴾ وَإِن لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ لِى فَٱعْتَزِلُونِ ﴿٢١﴾ فَدَعَا
رَبَّهُۥٓ أَنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمٌ مُّجْرِمُونَ ﴿٢٢﴾ فَأَسْرِ بِعِبَادِى لَيْلًا إِنَّكُم
مُّتَّبَعُونَ ﴿٢٣﴾ وَٱتْرُكِ ٱلْبَحْرَ رَهْوًا ۖ إِنَّهُمْ جُندٌ مُّغْرَقُونَ ﴿٢٤﴾ كَمْ
تَرَكُوا۟ مِن جَنَّـٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٢٥﴾ وَزُرُوعٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٢٦﴾ وَنَعْمَةٍ
كَانُوا۟ فِيهَا فَـٰكِهِينَ ﴿٢٧﴾ كَذَٰلِكَ ۖ وَأَوْرَثْنَـٰهَا قَوْمًا ءَاخَرِينَ ﴿٢٨﴾
فَمَا بَكَتْ عَلَيْهِمُ ٱلسَّمَآءُ وَٱلْأَرْضُ وَمَا كَانُوا۟ مُنظَرِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَقَدْ
نَجَّيْنَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ مِنَ ٱلْعَذَابِ ٱلْمُهِينِ ﴿٣٠﴾ مِن فِرْعَوْنَ ۚ إِنَّهُۥ
كَانَ عَالِيًا مِّنَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ وَلَقَدِ ٱخْتَرْنَـٰهُمْ عَلَىٰ عِلْمٍ عَلَى
ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٣٢﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُم مِّنَ ٱلْـَٔايَـٰتِ مَا فِيهِ بَلَـٰٓؤٌا۟ مُّبِينٌ
﴿٣٣﴾ إِنَّ هَـٰٓؤُلَآءِ لَيَقُولُونَ ﴿٣٤﴾ إِنْ هِىَ إِلَّا مَوْتَتُنَا ٱلْأُولَىٰ وَمَا
نَحْنُ بِمُنشَرِينَ ﴿٣٥﴾ فَأْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَـٰدِقِينَ ﴿٣٦﴾ أَهُمْ
خَيْرٌ أَمْ قَوْمُ تُبَّعٍ وَٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ أَهْلَكْنَـٰهُمْ ۖ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ مُجْرِمِينَ
﴿٣٧﴾ وَمَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا لَـٰعِبِينَ ﴿٣٨﴾
مَا خَلَقْنَـٰهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٩﴾

ئایینەكەیو خواش ئاوا هەڕەشەیەكی لێكردن كە لە بەدردا هاتە دی.

(١٧) جا بەراستی پێش ئەوانیش هۆزی فیرعەونیشمان تاقیكردەوەو پێغەمبەرێكی بەڕێزمان بۆ ناردن كە موسا عليه‌السلام بو.

(١٨) كەپێی وتن: بەندەكانی ﷲم بدەرە دەستوستەمیان لێ مەكە بێگومان كە من پێغەمبەرێكی دەستو دەم پاكم بۆ ئێوەو هەرگیز بە خراپەتان ڕازای نیمو پێم خۆشە بە خۆشیو سەرفەرازی بژینو فەرمانی ﷲ جێ بەجێ بكەن.

(١٩) سا لەڕاست ﷲدا خۆتان بە زل مەزانن، بێگومان من بە بەلگەیەكی ڕۆشنكەرەوە هاتومەتە لاتان، بەلگەكانیشم كە دەستو عەساكەمە سەلمێنەری ڕاستیو دروستی پێغەمبەرێتی منن، بەلام ئەوان هەڕەشەیان لێكرد، جا ئەو پێغەمبەرە بەرێزە وتی:

(٢٠) بێگومان من پەنا دەگرم بە پەروەردگارمو پەروەردگارتان لەوەی كە بەرد بارانم بكەنو ئێشو ئازارم بۆ دروست بكەن.

(٢١) جا ئەگەر باوەڕیشم پێناكەن، سا وازم لێبێنن، بەلام ئەوان لە سزادانی وازیان نەهێنا.

إِنَّ يَوۡمَ ٱلۡفَصۡلِ مِيقَٰتُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٠﴾ يَوۡمَ لَا يُغۡنِي مَوۡلًى عَن مَّوۡلٗى شَيۡـٔٗا وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ﴿٤١﴾ إِلَّا مَن رَّحِمَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٢﴾ إِنَّ شَجَرَتَ ٱلزَّقُّومِ ﴿٤٣﴾ طَعَامُ ٱلۡأَثِيمِ ﴿٤٤﴾ كَٱلۡمُهۡلِ يَغۡلِي فِي ٱلۡبُطُونِ ﴿٤٥﴾ كَغَلۡيِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٦﴾ خُذُوهُ فَٱعۡتِلُوهُ إِلَىٰ سَوَآءِ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٤٧﴾ ثُمَّ صُبُّواْ فَوۡقَ رَأۡسِهِۦ مِنۡ عَذَابِ ٱلۡحَمِيمِ ﴿٤٨﴾ ذُقۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡكَرِيمُ ﴿٤٩﴾ إِنَّ هَٰذَا مَا كُنتُم بِهِۦ تَمۡتَرُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٖ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٖ وَعُيُونٖ ﴿٥٢﴾ يَلۡبَسُونَ مِن سُندُسٖ وَإِسۡتَبۡرَقٖ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴿٥٤﴾ يَدۡعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلۡمَوۡتَ إِلَّا ٱلۡمَوۡتَةَ ٱلۡأُولَىٰۖ وَوَقَىٰهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّكَۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿٥٧﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرۡنَٰهُ بِلِسَانِكَ لَعَلَّهُمۡ يَتَذَكَّرُونَ ﴿٥٨﴾ فَٱرۡتَقِبۡ إِنَّهُم مُّرۡتَقِبُونَ ﴿٥٩﴾

سُورَةُ الجَاثِيَةِ ٤٥ ٣٧

﴿٢٢﴾ ئەوسا ڕوی کردە پەروەردگاریو داوای لێکردو وتی: بێگومان کە ئەمانە گەلێکی تاوانبارن، جا پەروەردگاری هات بەدەمیەوەو نزاکەی لێوەرگرتو بڕیاری سزادانیانی دا.

﴿٢٣﴾ جا فەرموی: دەی شەو بەندەکانی من، ئەوانەی کە باوەڕیان پێت هێناوە ببەرە دەرەوەو ڕاکەو لە دەستی فیرعەون خۆت دەربکە، بێگومان کە ئەوانیش بەدواتاندا دێن کە ئەمە داوێکە بۆ فیرعەون کەالله هەرخۆی دەزانێت کە چۆن نەخشەی بۆ دەکێشێت، بەڵێ موسا دەرچو تا گەیشتە لێواری دەریای نیل لە میسرو ڕۆژ بویەوەو فیرعەون بە لە شکرەکەیەوە کە بۆی کۆکرا بویەوە گەیشتنە لایانو گەلەکەی موسا وتیان: ئەی موسا ئەوە فیرعەون هاتو بەردەمیشمان دەریایەو چی بکەین؟ ترسێکی وا دای گرتن مەگەر هەر خۆی بزانێ، موسا وتی: بێگومان من الله م لەگەلدایە.

جا الله بە موسای فەرمو: عەساکەت لەو دەریایە بدەو موسایش عەساکەی لێداو دەریا لەت بو هەر یەکەی بە ئەندازەی چیایەك بەرزبوو پەروەردگار ئەو ڕێگایەی زۆر بەزوی وشکی کردەوە بۆیان، جا موسا بەخۆیو پەیڕەوانیەوە لەو دەریایە دەرچونو فیرعەونیش بە لەشکرەکەیەوە گەیشتە لێواری دەریاکە،

﴿٢٤﴾ جاالله فەرموی: موسا واز لەو دەریایە بهێنە با هەروا بمێنێتەوە، بێگومان ئەوانە سەرباز گەلێکن لەناویدا دەخنکێنرێن، بەڵێ وا ستەمکاران لەناو ئەو دەریایەدا خنکێنرانو هیچیان دەرنەچون، چونکە دەریاکە کاتێك کە ئەوان بە تەواوی هاتنە ناویەوە یەکی گرتوهەمویان کەوتنە بن دەریاکەوە

﴿٢٥﴾ زۆرێك لە باخچەو کانیاوان،

﴿٢٦﴾ لە شینایىو جێگای بەرێزیان.

﴿٢٧﴾ وە لە نازو نیعمەتێك کە لەناویدا کەیفیان دەکرد، هەمویان بەجێهێشتو ئەوان هەر بە خنکاندنیان چونە ناو ئاگرەوە.

﴿٢٨﴾ جا پەروەردگار دەفەرموێ: بڕیاری ئێمە هەر ئاوایەو نەگۆڕاوە بۆ ستەمکاران، خۆ ئێمە گەلێکی ترمان دانا لە جێگایاندا.

﴿٢٩﴾ ئەوسا کاتی هاتنی سزایان نە ئاسمان بۆیان گریاو نە زەویىو ئیتر هیچ ماوەیشیان پێنەدرا بۆ ژیان، واتە هیچکەس خەمی نەخواردن.

﴿٣٠﴾ جا بەڕاستی نەوەی ئیسرائیلمان لەو سزا سوك کەرەیە ڕزگار کرد.

﴿٣١﴾ لەو فیرعەونەی کە بەڕاستی ئەو لەو کەسانە بو کە لە تاوانو خراپە کاریدا لە سنور تێپەڕیبون.

﴿٣٢﴾ جا بەڕاستی ئێمە ئەوانمان هەڵبژاردبو بەسەر خەڵکی جیهانیانی سەردەمی خۆیاندا لەسەر زانیاریەك کە بومان دەربارەیان.

﴿٣٣﴾ جا لە نیشانەگەلێك بەوانمان دابو وەك دەستی موساو عەساکەیو لەتکردنی دەریاو شتی تریش تاقیکردنەوەیەکی ڕوونی تێدابو بۆ هەر کەسێك کە مەبەستی ڕێگای ڕاستی بوایە، بەڵام فیرعەونو دەستو پێوەندەکانی باوەڕیان پێنەکرد تا بەو ڕۆژە ڕەشە گەیشتنو ئەوەش سەر ئەنجامی هەمو خوا نەناسێکی تاوانبارە، بەڵێ ئەمانە باوەڕیان بە زیندوبوونەوە نەبوە.

﴿٣٤﴾ بەبێگومان ئەوانە دەڵێن:

(٣٥) جگە لە مردنی سەرەتا کە مەنی بووین‌و پاشان گیانمان تێکراوە تازە پاش مردن ئێمە زیندو ناکرێینەوە بۆ لێپرسینەوەو ژیانێکی تر نیە.

(٣٦) سا ئەگەر ڕاست دەکەن‌و زیندو کردنەوە هەیە دەی باو باپیرانمان بۆ بهێننەوە بە زیندویی.

(٣٧) خواش دەفەرموێ: ئایا ئەوان چاکترن یان گەلی توبەع لە سەبەئدابوون پاشان ﷲ وڵاتی وێران کردن‌و خۆیشیانی پارچە پارچەکرد لە وڵاتانداو ئەو کەسانەش کە لە پێش ئەواندا بوون کە لەناومان بردن؟ بەڕاستی ئەوانیش گەلێکی تاوانبار بون.

(٣٨) خۆ ئێمە ئاسمانان‌و زەوی‌و ئەوەی کە لەنێواندایە بە گاڵتەو بێسودو بێبەرنامە دروست نەکردووەو گەمەکەرنین.

(٣٩) ئەو دوانەمان تەنها بۆ مەبەستێکی ڕاست دروست کردون، بەڵام زۆربەیان نازانن‌و ڕاست و ناڕاست لەیەك جیا ناکەنەوە.

(٤٠) بێگومان ڕۆژی جیاکردنەوە کە ڕۆژی قیامەتە کاتی هەموویانەو دەبێ بە یەکسانی هەمویان بگرێتەوە،

(٤١) ڕۆژێکە کە هیچ دۆستێك هیچ کارێکی پێناکرێت بۆ دۆستی خۆی‌و ئەوان یارمەتی نادرێن.

(٤٢) جگە لەو کەسەی کە ﷲ بەزەیی پێدا هاتووەتەوە کە باوەڕدارانی ڕاستەقینەن‌و بە فەرمانی ﷲ توانای بەدەمەوە هاتن‌و تکا کردنیان هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە ﷲ ڕازی بێت بەو تکاکردنە بۆی، بێگومان کە ئەو هەر خۆیەتی دەسەڵاتدارو میهرەبان.

(٤٣) بێگومان ئەو درەختی ژەقنەموتە،

(٤٤) خواردنی گوناهبارانە،

(٤٥) کەوەکو مزی تواوە لەناو سکیاندا دەکوڵێت،

(٤٦) هەروەکو چۆن ئاوی گەرم لەسەر ئاگر دەکوڵێت.

(٤٧) جا فەرمان دەدرێت کە بیگرن، جا بە توندی ڕایکێشن بۆ ناوەڕاستی دۆزەخ.

(٤٨) پاشان لەو ئاوە کوڵیوە داخە بکەن بەسەریدا، بۆسزادان.

(٤٩) دەبخۆ بێگومان تۆ لە دنیادا بەدەسەڵات‌و بەڕێز بوویت. (ئەمە گاڵتە پێکردنیەتی).

(٥٠) بێگومان ئەوە ئەو سزایە بو کە ئێوە گومانتان لێی بو. جا پاش باسی خراپەکارو سزاکانیان، ئینجا باسی چاکەکاران‌و نیعمەتەکانیان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٥١) بێگومان پارێزکاران لە ڕۆژی قیامەتدا لە جێگای هێمندان نەترسیان لە مردنەو نەترسیان لە دەرچوونەو هیچ خەمێکیان نیەو لە فڕوفێڵی شەیتان‌و شەیتان سیفەتان ڕزگارن‌و هیچ دەردو بەڵایەکیان نیە.

(٥٢) لەناو باخچەگەلی چڕوپڕو کانیانی ئاودان.

(٥٣) کە لە هەورێشمی تەنك‌و قایم دەپۆشن، هەمویان ڕووبەڕووی یەکترن‌و هاو سن‌و ساڵن.

(٥٤) هەر ئاوەها کە ئەو جێگا هێمن‌و باخچەو کانیاو و پۆشاکە جوانانەمان پێداون لە ئافرەتە جوان‌و چاو گەورەکانیشمان پێداون کە پێش خۆیان نە جنۆکەو نە مرۆڤ توخنیان نەکەوتوون.

(٥٥) لەناویدا داوای هەمو میوەیەك دەکەن‌و دڵنیاشن کە دەستیان دەکەوێت‌و بۆیان دێنن.

(٥٦) تازە لەناویدا مردن تام ناکەن مەگەر تامی مردنی پێشوو کە هێشتا لە بیریان مابێت، وەخوا لە سزای دۆزەخ دەیانپارێزێت.

(٥٧) ئەمە چاکەیەکە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆ پارێزکاران، ئەوەش هەر خۆی سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ پارێزکاران، چونکە ئەوان لە دنیادا چاکەیان کردوەو پەروەردگاریش پاداشتی چاکەیان بە چەندین بەرامبەر دەداتەوە، جا ژیر ئەو کەسەیە کەئاوا جوان ڕەفتار بکات تا بەم سەرکەوتنە گەروەیە بگات.

(٥٨) جا ئەم قورئانەمان هەر بە زمانی تۆ کە عەرەبیە بە ئاسان کراوی نارده لات، بەڵکو ئەوانیش تێیبگەن‌و بیربکەنەوە، جا لە تاوان‌و خوانەناسی بگەڕێنەوەو دەست بەم قورئانەوە بگرن تا لە هەردوو ژیاندا سەرفەرازبن.

(٥٩) سا تۆ چاوەڕێی هاتنی بەڵێنی پەروەردگارت بکەو بێگومان ئەوانیش چاوەڕێی نەمانی تۆ دەکەن‌و بەم زوانە دەزانن کێ سەرکەوتو خۆشبەختەو کێیش دۆڕاوو شەرمەندەو بەدبەختە.

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ إِنَّ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلْأَرْضِ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِى خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ
لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ وَمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ
مِن رِّزْقٍ فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَتَصْرِيفِ ٱلرِّيَٰحِ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ
يَعْقِلُونَ ﴿٥﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ نَتْلُوهَا عَلَيْكَ بِٱلْحَقِّ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَ
ٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ يُؤْمِنُونَ ﴿٦﴾ وَيْلٌ لِّكُلِّ أَفَّاكٍ أَثِيمٍ ﴿٧﴾ يَسْمَعُ ءَايَٰتِ
ٱللَّهِ تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ثُمَّ يُصِرُّ مُسْتَكْبِرًا كَأَن لَّمْ يَسْمَعْهَا فَبَشِّرْهُ بِعَذَابٍ أَلِيمٍ
﴿٨﴾ وَإِذَا عَلِمَ مِنْ ءَايَٰتِنَا شَيْـًٔا ٱتَّخَذَهَا هُزُوًا أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ
مُّهِينٌ ﴿٩﴾ مِّن وَرَآئِهِمْ جَهَنَّمُ وَلَا يُغْنِى عَنْهُم مَّا كَسَبُوا۟ شَيْـًٔا
وَلَا مَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٠﴾ هَٰذَا
هُدًى وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَهُمْ عَذَابٌ مِّن رِّجْزٍ أَلِيمٌ ﴿١١﴾
۞ ٱللَّهُ ٱلَّذِى سَخَّرَ لَكُمُ ٱلْبَحْرَ لِتَجْرِىَ ٱلْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِۦ وَلِتَبْتَغُوا۟ مِن
فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى
ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٣﴾

## ٤٥ سورەتی جاسیه ٣٧

وشەی (**جاثية**) تەنها لەم سورەتەدا هاتوە، جا ئەم سورەتە بە سورەتی جاسیه ناسراوە، سورەتی چلوپێنجەمی قورئانە،لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، سیو سێ ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستو چوارەمەو پاش سورەتی (**الدُّخَان**) و پێش (**الأحْقَاف**) دابەزیوە.

بەناوی اللهی زۆربەسۆزوبێنیهایەت میهرەبان

(١) حا، میم. الله هەر خۆی دەزانێ مەبەست لەم دوو پیتە چیە.

(٢) دابەزینی ئەم پەڕاوە کە قورئانە لەلایەن اللهی دەسەڵاتداری داناوەیە.

(٣) بێگومان لە ئاسمانانو لەم زەویدا نیشانەی زۆر هەیە بۆ پەندو ئامۆژگاریو ناسینی الله (بۆ هەمو کەس بەڵام چونکە هەر باوەڕداران سودی لێ وەردەگرن لەبەرئەوە فەرموی) بۆ باوەڕداران.

(٤) خۆ لە دروستکردنی ئێوەشدا بەو شێوازە جوانو رێكوپێکەو ئەوەی کە بڵاوی دەکاتەوە لەوهەمو جانەورە جۆراوجۆرانە، بەڵگەگەلی زۆرن بۆ گەلێك کە دڵنیان لە بیروباوەڕی خۆیاندا.

(٥) خۆ لە گۆڕانی شەوو ڕۆژو لەوەی کە الله ڕەوانەی کردوە لە ئاسمانەوە کە بارانەو هۆی ڕۆزی گیانلەبەرانە، ئەوسا بەو ئاوە ئەم زەویە پاش مردنی زیندو کردوەتەوە بە کانیاوو شینایی، وە لە گۆڕانی با هەر جارێك لەلایەکەوەو هەندێك بەسودو هەندێکیش دەکات بەهۆی سزا، لەهەمو ئەمانەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە تێدەگەنو ژیری خۆیان دەخەنە کارەوەو لەو هەمو بەڵگانە سود وەردەگرن.

(٦) ئەوە نیشانەکانی الله یە بۆ مەبەستێکی ڕاستەقینە دەیخوێنینەوە بەسەرتا، جا ئەگەر بەو باوەڕناکەن ئەی پاش الله بەقسەو بە نیشانەکانی کێی تر باوەڕ دەکەن؟! لەپاشدا دەفەرموێ:

(٧) وای بۆ هەمو خیانەتکارو گوناهبارێك کە تانە لە پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی دەداتو بە جادوو و بەقسەی پڕوپوچی ناو دەبات.

(٨) هەر کاتێك نیشانەکانی اللهی بۆ بخوێنرێتەوە دەیبیسێت، پاشان هەر سور دەبێت لەسەر خۆ بەزلگرتنو لادان لە ڕاستی وەکو ئەوەی هەر نەیبیستبێت، سا تۆ بەو کەسە موژدە بدە بە سزایەکی بەژان. چونکە ئەو کەسە مرۆڤێکی دڵنخۆشو لاسارە.

(٩) خۆ هەر کاتێك لە نیشانەکانی ئێمە شتێك بزانێ لەجیاتی گوێڕایەڵیو باوەڕ پێکردنی گاڵتەی پێدەکات، بۆ ئەوانە سزایەکی سەر شۆڕکەر هەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا لەناو ئاگردا یاری پێدەکات.

(١٠) لەپێش دەمیاندا دۆزەخ هەیە نە ئەو کارو کۆششەی کە کردویانە هیچ سودێکیان پێدەدات، وە نە ئەوانەی کە جگە لە الله کردویانن بە دۆست بۆ خۆیان دێن بەهانایانەوە،وە نەهیچ سودیان پێدەگەیەنن، ئەوساسزایەکی گەورەشیان بۆ هەیە لەسەر ئەو ڕەفتارو گوفتارە ناپەسەندو نابەجێیەی کە دەیکەن لە دنیادا.

(١١) ئەم قورئانە ڕینمونی کەرە بۆ ڕێگای ڕاست، جا ئەو کەسانەی کە نیشانەکانی پەروەردگاریان ناناسن بەشێکی گەورەیان بۆ هەیە لە سزای بەژان.

(١٢) الله ئەو زاتەیە کە دەریای رامکردوە بۆتان تا کەشتی بە فەرمانی ئەو هاتوچۆی تێدا بکات، وەتا بەو هاتوچۆیەش فەرو

خێری ئەو زاتەتان دەست بکەوێت بەڵکو ئێوەش شوکرانە بژێربن‌و سپڵەو نمەك نەناس نەبن، جا وانەزانن کە ئەوە بەهۆی ئازایی‌و لێهاتویی خۆتانە، چونکە سەرچاوەی ئەو هەمو شتانە ژیریە کە گەورەترین نیعمەتەو ئەویش ﷲ بە مرۆڤی بەخشیوەو بە هەر کەسێکی نەبەخشی ئەو کەسە شێتەو هیچ نازانێت‌و هیچ ئیشێکی بەکەڵك‌و بەسودی لێ چاوەڕێ ناکرێت، کەواتە سوپاسی خوا بکەن بەو عەقڵەی کەپێی بەخشیون کە بتوانن بەجوانی سود لەنیعمەتە فرەوانەکانی وەربگرن.

(١٣) ئەوسا ئەوەی کە لەناو ئاسمانان‌و زەویدایە هەموی موڵکی ئەوەو سەرجەم رامیکردوە بۆتان، بێگومان لەوەدا چەندین بەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە بیر بکاتەوە لەم بونەوەرە گەرەیە کە بە هەزاران یاسای ڕێك‌و پێکی تێدایە هەر یەکێك لەوانە بەسە بۆ مرۆڤی ژیر کە خوای خۆی پێبدۆزێتەوە.

(١٤) ئەی محمد ﷺ تۆ بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە بڵێ: با چاوپۆشی بکەن لەو کەسانەی کە باوەڕیان بەکارەسات‌و ڕووداوە کتوپڕو دڵ تەزێنەکانی ﷲ نیەو ناترسن لەو زاتە، بۆ ئەوەی هەر گەلێك پاداشت بداتەوە بە گوێرەی کارو کۆششێك کە خۆیان دەیکەن.

(١٥) هەر کەسێك ئیشی چاك بکات سودەکەی بۆ خۆیەتی، وە هەر کەسێکیش ئیشی خراپ بکات زیانەکەی لەسەر خۆیەتی لەپاشان بۆلای پەروەردگارتان دەبرێنەوە بۆ پاداشت‌و سزا، چاك بەچاك‌و خراپ بە خراپ.

(١٦) جا بە راستی ئێمە پەڕاو و کارزانی‌و پێغەمبەراتیمان دا بە نەوەی یەعقوب عليه السلام کە موساو هارون سەرڤافڵەیان بون، وە لە شتە پاکەکان وەکو گەزۆو شیلاقەمان کرد بە ڕۆزیان‌و بەسەر خەڵکی زەمانی خۆیاندا بەرزمان کردنەوە.

(١٧) خۆ ئێمە لە فەرمانی ئەم ئایینە بەڵگەی ڕۆشنمان پێدان، حەرام‌و حەڵاڵمان بۆباسکردبون و مژدەی هاتنی ئەم پێغەمبەرەی ئاخر زەمانمان ﷺ پێدابون، جا ناڕێك نەبون لەوەی کە ئەگەر پێغەمبەرێك بەم ناوو نیشانانە هات باوەڕی پێبکەن، بەڵام پاش ئەوەی کە ئەو زانیاریە ڕاستە کە هاتنی پێغەمبەر بو ﷺ هاتەلایان هەر لەبەر ئیرەیی لەنێوانی خۆیاندا ناڕێك بون، هەندێکیان باوەڕیان هێناو هەندێکیشیان دژایەتیان کرد، بێگومان پەروەردگارت لە ڕۆژی قیامەتدا لەنێوانیاندا لەبارەی ئەو شتەوە کە تێیدا ناڕێك بوون بڕیار دەدات پاداشتی باوەڕدارانیان بە چاکە دەداتەوەو خراپەکارانیشیان بە ئاگری گەورەو ئاوی داخ‌و زۆخ‌و

قُلْ لِلَّذِينَ آمَنُوا يَغْفِرُوا لِلَّذِينَ لَا يَرْجُونَ أَيَّامَ اللَّهِ لِيَجْزِيَ قَوْمًا بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (١٤) مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَنْ أَسَاءَ فَعَلَيْهَا ۖ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّكُمْ تُرْجَعُونَ (١٥) وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ (١٦) وَآتَيْنَاهُمْ بَيِّنَاتٍ مِنَ الْأَمْرِ ۖ فَمَا اخْتَلَفُوا إِلَّا مِنْ بَعْدِ مَا جَاءَهُمُ الْعِلْمُ بَغْيًا بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ رَبَّكَ يَقْضِي بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِيمَا كَانُوا فِيهِ يَخْتَلِفُونَ (١٧) ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ (١٨) إِنَّهُمْ لَنْ يُغْنُوا عَنْكَ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا ۚ وَإِنَّ الظَّالِمِينَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاءُ بَعْضٍ ۖ وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُتَّقِينَ (١٩) هَٰذَا بَصَائِرُ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ (٢٠) أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا السَّيِّئَاتِ أَنْ نَجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَوَاءً مَحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ (٢١) وَخَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَلِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍ بِمَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ (٢٢)

کێمی دۆزەخیان سزا دەدات، ئینجا پەروەردگار ڕوو بە پێغەمبەرمان ﷺ دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٨) پاش ئەوەی کە هەڵس‌و کەوتی نەوەی یەعقوبت زانی، بزانە کە ئێمە تۆمان لەم فەرمانەی خۆماندا لەسەر یاسایەك داناوە کە ڕێك ڕاست‌و تەواوە، جا تۆش پەیڕەوی بکەو نەکەی دوای ئارەزۆی ئەو کەسانە بکەویت کە چاك‌و خراپ لێك جیا ناکەنەوەو بە نەزانانە هەنگاو هەڵدەگرن.

(١٩) دڵنیابە کە ئەوانە لەباتی ﷲدا هیچ سودێکت پێناگەیەنن‌و بێگومان کە ستەمکاران هەندێکیان لایەنگرو یارمەتی دەری هەندێکیانن‌و ﷲیش یارمەتیدەرو دۆستی پارێزکارانە.

(٢٠) ئەم قورئانە چاو ڕوونەکەرەوەیە بۆ خەڵك‌و ڕێنمای کەرو بەزەییە بۆ گەلێك کە باوەڕی تەواوو خاڵی لە گومانیان هەبێت بە ﷲ‌و بەرۆژی دوایی‌و بە پێغەمبەر ﷺ و بە بەرنامەکەی.

(٢١) ئایا وا دەزانن کە ئەو کەسانەی کە خراپەیان کردوە وەکو ئەو کەسانەیان هەژمار دەکەین کە باوەڕیان هێناوەو ئیشی چاکیان کردوە؟! ژیانیان‌و مردنیان وەکو یەکە؟! چ خراپ بڕیارێك دەدەن، کەی ڕەوایە بۆ زاتێکی وا ئاوا بڕیارێکی بۆ بدرێت ئەمە گەمە کردنە یان باوەڕ نەبونە بە دادگەری ﷲ پاك‌و بێ عەیبی هەر بۆ ئەوە.

أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ ٱللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ ٱللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾ وَقَالُوا۟ مَا هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا يُهْلِكُنَآ إِلَّا ٱلدَّهْرُ ۚ وَمَا لَهُم بِذَٰلِكَ مِنْ عِلْمٍ ۖ إِنْ هُمْ إِلَّا يَظُنُّونَ ﴿٢٤﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ مَّا كَانَ حُجَّتَهُمْ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتُوا۟ بِـَٔابَآئِنَآ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يَجْمَعُكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٢٦﴾ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَيَوْمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ يَوْمَئِذٍ يَخْسَرُ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٢٧﴾ وَتَرَىٰ كُلَّ أُمَّةٍ جَاثِيَةً ۚ كُلُّ أُمَّةٍ تُدْعَىٰٓ إِلَىٰ كِتَٰبِهَا ٱلْيَوْمَ تُجْزَوْنَ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ هَٰذَا كِتَٰبُنَا يَنطِقُ عَلَيْكُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّا كُنَّا نَسْتَنسِخُ مَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٩﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُدْخِلُهُمْ رَبُّهُمْ فِى رَحْمَتِهِۦ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٠﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَفَلَمْ تَكُنْ ءَايَٰتِى تُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱسْتَكْبَرْتُمْ وَكُنتُمْ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا قِيلَ إِنَّ وَعْدَ ٱللَّهِ حَقٌّ وَٱلسَّاعَةُ لَا رَيْبَ فِيهَا قُلْتُم مَّا نَدْرِى مَا ٱلسَّاعَةُ إِن نَّظُنُّ إِلَّا ظَنًّا وَمَا نَحْنُ بِمُسْتَيْقِنِينَ ﴿٣٢﴾

﴿٢٢﴾ سا الله ئەم ئاسمانانو زەویەی بەڕاستی دروستکردوە تا هەمو کەسێك بەشێوەی کۆششێك کەخۆی کردویەتی پاداشت بداتەوە، خۆئەوان هیچ ستەمێکیشیان لێ ناکرێت، چاکە دەبێت بە چاکی پاداشتی بدرێتەوەو خراپەیش بە خراپ تۆڵەی لێوەرگیرێت.

﴿٢٣﴾ ئایا تۆ نەتبینی ئەو کەسەی کە ئارەزۆی خۆی کردوە بە خودای خۆی، واتە: بەگوێرەی ئارەزۆی خۆی ڕەفتاری کردوە کە ئەمە پەرستنە، جا پێویستە باوەڕداران چاك لەم جۆرە ئایەتانە بیر بکەنەوەو وانەزانن پەرستن هەر ئەوەیە کە نوێژی بۆ بکەیت یان سوجدەی بۆ ببەیت، نەخێر پەیڕەوی کردنی هەر شتێك لە ڕوانگەی ئیسلامەوە عیبادەتە، جا ئەگەر بۆ خواو پێغەمبەرو قورئان بو ئەوە جێگای خۆیەتیو بەهرەمەندو سەرفەرازە، بەڵام ئەگەر بۆ جگە لەوان بو سەرشۆڕو شەرمەندەو ڕەنجەڕۆیە، بەڵێ الله ئاگای لەم جۆرە کەسانە هەیە بۆیە دەفەرموێ: الله بەگوێرەی زانیاریەك کە هەیەتی لەبارەی ئەو کەسەوە، سەری لێتێکداوەو گوێچکەو دڵی مۆرکردوەو لێڵاوی هێناوە بەسەر چاویداو ئیتر نە هیچ حەقێك دەبیسێتو نە هیچ ڕاستیەك دەچێتە دڵیەوەو نە هیچ بەڵگەیەکی چاو ڕۆشنکەرەوە دەبینێت.دەی ئیتر پاش الله کێ هەیە کە ئەو کەسە ڕێنمایی بکات؟ ئایا بیر ناکەنەوە؟!

﴿٢٤﴾ جا ئەوانە دەڵێن: ئەم ژیانە هەر ئەم ژینەیە کە لەدنیادا هەیەو دەمرینو دەژینو هەر گەردوون لەناومان دەبات، مرێنەرو زیندووکەرەوەیەکی ترمان نیەو ئەوان لەم بارەشەوە هیچ زانیاریەکیان نیە، بەڵکو ئەوان هەر بە خەملاندن قسەو بڕیار دەدەنو هیچی تریان بەدەستەوە نیە.

﴿٢٥﴾ ئەوسا هەر کاتێك نیشانە ئاشکراکانی ئێمەیان بۆ بخوێنرێتەوە هیچ بەلگەیەکیان نیە بۆ بەرپەرچدانەوەی جگە لەوەی کە دەڵێن: ئەگەر ڕاست دەکەنو زیندوبوونەوە هەیە با باو باپیرانمان بۆ بهێننەوە.

﴿٢٦﴾ بلێ: الله یە زیندوتان دەکاتەوەو پاشان دەتان مرێنێتو پاشان لە ڕۆژی قیامەت کە هیچگومان لە هاتنو بوونیدا نیە کۆتان دەکاتەوە بۆ حیسابو پاداشتو سزا هەر کەس بەگوێرەی ئیشی خۆی، بەڵام زۆربەی خەڵك ئەم ڕاستیە نازانن، بۆیە دان بە زیندوکردنەوەو حیساب دا نانێن بەڵام ئەم نەزانینەی ئەوان هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێتو باری ئەوان سوك ناکات، ڕاستە ئەوان ماوە دەدرێن بەڵام لە بیر نابرێنەوە.

﴿٢٧﴾ وە ئاسمانانو زەوی موڵکی الله یەو هەر کاتێك کە قیامەت هات ئیتر ئەو ڕۆژە بێهودەکاران ڕەنجەڕۆ دەبن. چونکە ئەوڕۆژەجگە لە شیوەنو زاریو نوکەو ناڵینو سزای ئاگرو ئاوی داخ شتێکی تریان بۆ نامێنێتەوە.

﴿٢٨﴾ ئەوسا تۆ دەبینیت لەو ڕۆژەدا هەمو گەلێك بەئەژنۆدا کەوتووەو هەمو گەلێك بانگ دەکرێن بۆ لای پەروەندەی خۆی، جا(پێیان دەوترێ) ئەمڕۆ پاداشتی کردوەکانتان دەدرێتەوە. ئینجا خوا دەفەرموێ:

﴿٢٩﴾ ئەمە پەڕاوی ئێمەیە کە کردارو گوفتاری ئێوەی تێدا تۆمار کراوە کە بەڕاستی قسە لەگەڵ ئێوەدا دەکات نە زیادو نە کەمی لەسەرتان نەوتوە، بێگومان کە ئێمە وێنەمان گرتوە لە ئەو کردارانەی کە کردوتانە.

﴿٣٠﴾ جا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکیان کردوە، ئەوسا پەروەردگاریان دەیانخاتە ناو نازو نیعمەتو سۆزی خۆیەوە، ئەوە هەر خۆی بەختەوەرییەکی ئاشکرایە بۆ ئەو باوەڕدارانە.

﴿٣١﴾ بەڵام ئەو کەسانەی کە باوەڕیان نەهێناوە، ئینجا ڕویان تێدەکاتو دەفەرموێ: ئایا نیشانەکانی ئێمە بۆ ئێوە نەهاتو نەخوێندرایەوە بەسەرتاندا؟ جا ئێوە خۆتان بەزلگرتو گوێتان

بەو نیشانانە نەدا، جا ئێوە گەلێکی تاوانبارن بە هۆی کرداری ناپەسەندتانەوە. جا ئێوە سەرەڕای بێباوەڕیو ڕقبونەوەی ناو دەرونتان لەم پێغەمبەرە ﷺ و پەیامە بە نرخەکەی کە هاتووەتە لاتان.

(٣٢) خۆ هەر کاتێکیش پێتان بوترێت کە بێگومان بەڵێنی اللَّهُ ڕاستەو هیچ گومانێك لە هاتنی قیامەتدا نیە، ئێوە دەڵێن: ئێمە نازانین قیامەت چیە؟ جگە لە گومان بە هاتنی ئەو ڕۆژە باوەڕمان بە هیچی تر نیەو ئێمە بەم قسانە دڵمان ئاو ناخواتەوەو باوەڕت پێناکەین. جا قورئان دەمان باتەوە بۆ قیامەتو دەفەرموێ:

(٣٣) جاکاتێك هات ئاشکرا دەبیت بۆیان ئەو کارە خراپانەی کەکردویانە، جا ئەو ژیانەی کە ئەوان بە گاڵتەیان دەزانیو باوەڕیان بە هاتنی نەبو، وا هاتو یەخەی گرتن. جا ئەو کاتە ناتوانن نە خۆیان حەشار بدەنو نە کردارەکانیشیان بشارنەوە.

(٣٤) وە دەوترێت: جا ئەمڕۆ پشتگوێتان دەخەین لەناو ئەو سزایەداو بۆخۆتان دەمێننەوە و کەس لێتان ناپرسێتەوە هەروەك چۆن ئێوە وازتان لە کرداری چاك هێنا وخۆتان ئامادە نەکرد بۆ گەیشتنتان بەم ڕۆژەتانو جێگاشتان ئاگرەو هیچ یارمەتیدەرێکتان نیە.

لە فەرمودەدا هاتوە کە پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا بە هەندێ لە بەندەکانی دەفەرموێ:{ أَلَمْ أَجْعَلْ لَكَ سَمْعًا وَبَصَرًا وَمَالًا وَوَلَدًا وَسَخَّرْتُ لَكَ الْأَنْعَامَ وَالْحَرْثَ وَتَرَكْتُكَ تَرْأَسُ وَتَرْبَعُ فَكُنْتَ تَظُنُّ أَنَّكَ مُلَاقِي يَوْمَكَ هَذَا قَالَ فَيَقُولُ لَا فَيَقُولُ لَهُ الْيَوْمَ أَنْسَاكَ كَمَا نَسِيتَنِي /الترمذي.وصححه الالباني/ ئایا گوێو چاوو سامان منالم پێنەدایت؟ ئایا چارەوێو وشترو مەڕو ماڵاتم بۆ رام نەکردیت؟ وە وازم لێ نەهێنایت تا بویت بە سەردار و پلەو پایە بەرز کە چوار یەکی غەنیمەت بۆخۆت وەربگریت؟ جا ئایا تۆ وات دەزانی کە دەگەییت بەم ڕۆژەت؟ فەرموی: یەڕێ : نەخێر، جا اللَّهُ ی باڵادەستیش پێی دەفەرموێ: ئەوسا ئەمڕۆ ئێمەیش تۆ لەبیر خۆمان دەبەینەوەو پشتگوێت دەخەین لەناو سزادا هەروەکو چۆن تۆ فەرمانەکانی ئێمەت لەبیر خۆت بردنەوەو پشتگوێت خستن}

(٣٥) ئەم سزاو لەبیر بردنەوەتان بەهۆی ئەوەبووە کە بێگومان ئێوە گاڵتەتان بە نیشانەکانی اللَّهُ دەکردو ژیانی دنیا

وَبَدَا لَهُمْ سَيِّئَاتُ مَا عَمِلُوا وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٣﴾ وَقِيلَ ٱلْيَوْمَ نَنسَىٰكُمْ كَمَا نَسِيتُمْ لِقَآءَ يَوْمِكُمْ هَٰذَا وَمَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ وَمَا لَكُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٤﴾ ذَٰلِكُم بِأَنَّكُمُ ٱتَّخَذْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ هُزُوًا وَغَرَّتْكُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ فَٱلْيَوْمَ لَا يُخْرَجُونَ مِنْهَا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٣٥﴾ فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ وَلَهُ ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿٣٧﴾

## سُورَةُ الأَحْقَافِ

٤٦ — ٣٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

حمٓ ﴿١﴾ تَنزِيلُ ٱلْكِتَٰبِ مِنَ ٱللَّهِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ مَا خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّآ أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ ﴿٣﴾ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِى مَاذَا خَلَقُوا مِنَ ٱلْأَرْضِ أَمْ لَهُمْ شِرْكٌ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ ۖ ٱئْتُونِى بِكِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ هَٰذَآ أَوْ أَثَٰرَةٍ مِّنْ عِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٤﴾ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّن يَدْعُوا مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسْتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ وَهُمْ عَن دُعَآئِهِمْ غَٰفِلُونَ ﴿٥﴾

هەڵیخەڵەتاندبون، ئەوسا ئەمڕۆ لەو سزایە دەرناهێنرێنو پەشیمانبونەوەو داوای لێبوردنتان لێوەرناگیرێت بەڵکو سزاتان بێ ژمارەیە، جا کاتێك پەروەردگار بڕیاری خۆی باسکرد سەبارەت بە باوەڕدارانو بێباوەڕان، بۆرێنمای کردنی بەندەکانی دەفەرموێ:

(٣٦) جا تەواوی سوپاس هەر شایستەی اللَّهُ یە، کەپەروەردگاری ئاسمانانو پەروەردگاری زەوییە، کەپەروەردگاری جیهانیانە.

(٣٧) ئەوسا لە ئاسمانانو زەویشدا گەورەیەتی هەر بۆ ئەوەو هەر خۆیەتی دەسەڵاتدارو کارزان. کەواتە، کەس شایانی خۆ بەزلگرتنو گەورەیەتی نیەو هەر کەس بە ناڕەوا خۆی بەزل بزانێت شەڕ لەگەل اللَّهُ دا دەکاتو دڵنیابێت کە بە زوویی سەرشۆڕو شەرمەندە دەبیت هەر لە دنیاداو سزای دواڕۆژیش هەر اللَّهُ خۆی دەزانێت چی لەگەڵ دەکات.

لە فەرمودەدا هاتوە کە اللَّهُ فەرمویەتی:{العَظَمَةُ إزاري وَالكِبرِيَاءُ رِدَائي، فَمَن نَازَعَني وَاحِداًمِنهُما أَسكَنْتُهُ نَارِي/مسلم/ واتە: گەورەیی کراسمەو شکۆمەندیش عەبامە، ئەوسا هەرکەسێك کێشەی یەکێك لەم دووانەم لەگەڵدا بکاتو بیەوێت خۆ بەزل بگرێت یان بە با شکۆیی تەماشای خۆی بکات دەیخەمە ناو ئاگرمەوە}.

وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُوا۟ لَهُمْ أَعْدَآءً وَكَانُوا۟ بِعِبَادَتِهِمْ كَٰفِرِينَ ﴿٦﴾ وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلْحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمْ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٧﴾ أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ إِنِ ٱفْتَرَيْتُهُۥ فَلَا تَمْلِكُونَ لِى مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا ۖ هُوَ أَعْلَمُ بِمَا تُفِيضُونَ فِيهِ ۖ كَفَىٰ بِهِۦ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ ۖ وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٨﴾ قُلْ مَا كُنتُ بِدْعًا مِّنَ ٱلرُّسُلِ وَمَآ أَدْرِى مَا يُفْعَلُ بِى وَلَا بِكُمْ ۖ إِنْ أَتَّبِعُ إِلَّا مَا يُوحَىٰٓ إِلَىَّ وَمَآ أَنَا۠ إِلَّا نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٩﴾ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ وَكَفَرْتُم بِهِۦ وَشَهِدَ شَاهِدٌ مِّنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ مِثْلِهِۦ فَـَٔامَنَ وَٱسْتَكْبَرْتُمْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠﴾ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَوْ كَانَ خَيْرًا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيْهِ ۚ وَإِذْ لَمْ يَهْتَدُوا۟ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفْكٌ قَدِيمٌ ﴿١١﴾ وَمِن قَبْلِهِۦ كِتَٰبُ مُوسَىٰٓ إِمَامًا وَرَحْمَةً ۚ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ مُّصَدِّقٌ لِّسَانًا عَرَبِيًّا لِّيُنذِرَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ وَبُشْرَىٰ لِلْمُحْسِنِينَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُوا۟ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسْتَقَٰمُوا۟ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿١٣﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ خَٰلِدِينَ فِيهَا جَزَآءًۢ بِمَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٤﴾

## ٤٦ سورەتی ئەحقاف ٣٥

وشەی (الاحقاف) تەنها لەم سورەتەدا هاتوە، جا ئەم سورەتە کە سیو پێنج ئایەتە بە سورەتی ئەحقاف ناسراوە، سورەتی چلوشەش هەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، وتراوە جگە لە ئایەتی دەیەم ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُمْ إِن كَانَ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ... ﴾ وە ئایەتی سیو پێنجەم﴿ فَٱصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْعَزْمِ مِنَ ٱلرُّسُلِ ﴾. وە جگە لە ئایەتی پانزەیەم تا ئایەتی حەڤدەیەم ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ...﴾ کە سێ ئایەتە. وەهەروەها وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستو پێنجەمەو پاش سورەتی (الجاثية) و پێش (الذاريات) دابەزیوە.

بەناوی اللهی زۆر بەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ حا میم. الله هەر خۆی دەزانێ مەبەست لەم دوو پیتە چیە

﴿٢﴾ دابەزینی ئەم قورئانە لەلایەن (الله)ی دەسەڵاتداری دانایەوەیە.

﴿٣﴾ ئەم ئاسمانانو زەویەو ئەوەی کەلە نێوانیاندایە هەر بۆ مەبەستێکی ڕاست کە بەڵگەن لەسەر هێزو زانایی‌و تەنهایی ئێمەو بۆ کاتێکی ناوبراو کە کاتی کاولبونی ئەم جیهانەیەو کاتی هاتنی قیامەتە دروستمان کردون، جا ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن لە هەر چی بترسێنرێن پشتی تێدەکەن‌و نایانەوێت کە ڕاستی بزانن‌و پەیڕەوی بکەن .

﴿٤﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ پیشانم بدەن ئەوەی کە جگە لە الله دەیپەرستن، پیشانم بدەن لەم زەویەدا چییان دروستکردوە؟ یان بڵێ: ئایا بۆئەوان لە ئاسماناندا هاوبەشێك هەیە؟ ئادەی پێش ئەم پەڕاوە با پەڕاوێکم بۆ بهێنن؟ یان پاشماوەیەك لە زانیاری کە لە کۆنەوە دەستیان کەوت بێت‌و نوسرابێ لەسەر ڕاستی‌و دروستی خۆیان بابیهێنن ئەگەر ڕاست دەکەن، ئاشکرایە کە هیچکام لەوانەیان نیە کەواتە درۆزنن‌و لە ڕاستی خۆ دەبوێرن، ئەم کارەشیان لە نرخی ڕاستی کەم ناکاتەوە تەنها خۆیان ڕەنجەڕۆو ڕیسوا دەبن.

﴿٥﴾ جا کێ هەیە گومڕاتر لەو کەسەی کە بێجگە لەالله شتێ بپەرستێت کە هەتا قیامەت وەڵامێکی نەداتەوە، بەڵکو ئەو پەرستراوانە لە پەرستنی ئەم بەندە نەفامانەی خۆیان بێئاگایشن؟!

﴿٤﴾ جا هەر کاتێك هەمو خەڵك کۆ بکرێتەوە ئەو پەرستراوانە دوژمنی ئەوانەن کە پەرستویانن‌و پەیڕەوییان لێکردون، خۆ باوەڕیشیان نیە بەو بەندایەتیەی کە بۆیان کردون. چونکە سزای ئەوانیشیان زیاد کردووە لەو جێگایەدا ناشتوانن لە خۆیشیان پارێزگاری بکەن چ جای پارێزگاری لە پەیڕەوانیان، ﴿ ضَعُفَ ٱلطَّالِبُ وَٱلْمَطْلُوبُ ﴾ حج: ٧٣ / عابیدو مەعبود هەردووکیان لاوازن.

﴿٧﴾ خۆ هەر کاتێك نیشانە ئاشکراکانی ئێمەیان بۆ بخوێنرێتەوە، جا ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن کاتێك کە ئەو ڕاستیە هاتە لایان‌و نەیانتوانی بە بەڵگە بچنەوە بگژیا دەڵێن: ئەمە جادویەکی ئاشکراوڕوونە.

﴿٨﴾ یان دەڵێن: ئەمە درۆیەکەو بۆ خۆی هەڵی بەستووە، بڵێ: ئەمە ئەگەر ـ وەك وای دادەنێن ـ هەڵبەستراوی خۆم بێت ئەوسا خۆ ئێوە خاوەنی هیچ شتێك نین بۆ من لەلای الله و هیچتان پێناکرێت، ئەو زاناترە لە هەمو کەس بەو پرو پاگەندەیەی کە ڕۆچوون تێیدا سەبارەت بە قورئان، بەسە کە ئەو زاتە خۆی شایەت بێت لەنێوان من‌و ئێوەدا، خۆ ئەو زاتە چاوپۆشیکەرە بۆ ئەو کەسەی کە پەشیمان دەبێتەوەو ڕوو دەکاتەوە لای‌و بەسۆزەو پەلە ناکات لە تۆڵە لێسەندنەوەتان بەڵکو پەشیمان ببنەوەو بگەڕێنەوە بۆلای.

وَوَصَّيۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيۡهِ إِحۡسَٰنًاۖ حَمَلَتۡهُ أُمُّهُۥ كُرۡهٗا وَوَضَعَتۡهُ كُرۡهٗاۖ وَحَمۡلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهۡرًاۚ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ أَشُدَّهُۥ وَبَلَغَ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ قَالَ رَبِّ أَوۡزِعۡنِيٓ أَنۡ أَشۡكُرَ نِعۡمَتَكَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتَ عَلَيَّ وَعَلَىٰ وَٰلِدَيَّ وَأَنۡ أَعۡمَلَ صَٰلِحٗا تَرۡضَىٰهُ وَأَصۡلِحۡ لِي فِي ذُرِّيَّتِيٓۖ إِنِّي تُبۡتُ إِلَيۡكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَعۡدَ ٱلصِّدۡقِ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِي قَالَ لِوَٰلِدَيۡهِ أُفّٖ لَّكُمَآ أَتَعِدَانِنِيٓ أَنۡ أُخۡرَجَ وَقَدۡ خَلَتِ ٱلۡقُرُونُ مِن قَبۡلِي وَهُمَا يَسۡتَغِيثَانِ ٱللَّهَ وَيۡلَكَ ءَامِنۡ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞ فَيَقُولُ مَا هَٰذَآ إِلَّآ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَوۡلُ فِيٓ أُمَمٖ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِم مِّنَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ خَٰسِرِينَ ﴿١٨﴾ وَلِكُلّٖ دَرَجَٰتٞ مِّمَّا عَمِلُواْۖ وَلِيُوَفِّيَهُمۡ أَعۡمَٰلَهُمۡ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿١٩﴾ وَيَوۡمَ يُعۡرَضُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ عَلَى ٱلنَّارِ أَذۡهَبۡتُمۡ طَيِّبَٰتِكُمۡ فِي حَيَاتِكُمُ ٱلدُّنۡيَا وَٱسۡتَمۡتَعۡتُم بِهَا فَٱلۡيَوۡمَ تُجۡزَوۡنَ عَذَابَ ٱلۡهُونِ بِمَا كُنتُمۡ تَسۡتَكۡبِرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَبِمَا كُنتُمۡ تَفۡسُقُونَ ﴿٢٠﴾

(٩) بڵێ لەناو ئەو پێغەمبەرانەدا من کەسێکی بێوێنەو تازە نیم تا ئێوە بکەونە گومانەوەو باوەڕم پێ نەکەن خۆ من نازانم لەدوای ئەمە چ بەسەر من یان ئێوەدا دێت؟ نازانم من لەم شارەم دەردەکرێم یان دەکوژرێم وەکو لەگەڵ پێغەمبەرانی پێشووی مندا کراوە، یان بەرد باران دەکرێم یان ئێوە بەناخی زەویدا دەبرێنە خوارەوە وەکو بێباوەڕانی پێش خۆتان، عەوفی کوڕی مالیك دەڵێت: ڕۆژێك لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ لە مەدینە چووینە کەنیسەیەکی جولەکەوە کە کاتی جەژنێکیبو لە جەژنەکانیان، جا ئەوان پێیان ناخۆشبو کە ئێمە چوینە ناویان، ئینجا پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون: {ئەی پێڕی جولەکە دوانزە پیاو لە خۆتانم بۆ بهێنن کە شایەتی بدات جگە لە ﷲ هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینە نیەو بێگومان محمد پێغەمبەری خوایە ﷺ و ﷲ لە تەواوی ئەو جولەکانەی کە لەژێر ئاسماندایە ئەو تورەیەی کە داوێتی بەسەریاندا لای دەبات. دەڵێت : بێدەنگبون‌و هیچکەسێك لەوان وەڵامیان نەدایەوە، پاشان جارێکی تر دووبارەی کردەوە بۆیان ئینجا هیچ وەڵامیان نەدایەوە بۆ سێهەم جار فەرمویەوەو وەڵامیان نەدایەوە، ئینجا فەرموی: {أَبَيتُم فَوَاللهِ إِنِّي لأَنا الحَاشِرُ وَ أَنا العَاقِب وَأَنا النَّبِيُّ المُصطَفَى امَنتُم أَو كَذَّبتم/أحمد، صححه الألباني/ ئێوە ئەوەتان نەکرد، ئەوسا بە خوا بێگومان کە من کۆکەرەوەم‌و من کۆتایی پێغەمبەرانم‌و من پێغەمبەرم‌و هەڵبژێرراوم، جا باوەڕم پێبکەن یان باوەڕم پێنەکەن} پاشان کە گەڕایەوەو من لە خزمەتیا بوم تا خەریکبو دەرچین لەناو کۆڕەکەیان لە دواوە پیاوێك بانگی کرد: ئەی محمد بوەستە، جا ڕوی کردە لایان وتی: بە پیاوێکی چۆنم دەزانن ئەی پێڕی جولەکە وتیان: بە خوا کەسێك شك نابەین کە لە تۆ زاناتر بێت بە پەڕاوەکەی خوا (تەورات)و لە تۆ شارەزاترو لە باوکت لە پێش تۆداو لە باوانت لە پێش باوکتدا، جا وتی: من شایەتی دەدەم کە ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە لە تەوراتدا دیوتانە، وتیان: درۆ دەکەیت جا نەك ئەوقسەیان لێوەر نەگرت بەڵکوقسەی خراپیشیان پێ وت، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:{بەدرۆتان خستەوە، بەڵام هەرگیز ئەو قسەتان لێوەرناگیرێت، ئەی ئەوە نەبو ئێستا سوپاستان کردوو بە چاکی باستان کرد بەڵام کاتێك باوەڕی هێنا بەدرۆتان خستەوەو وتتان پێی ئەوەی کە وتتان، ئەوسا قسەتان هەرگیز لێوەرناگیرێت} دەڵێ جا لەوێ دەرچوین کە سێ کەسبوین، پێغەمبەری خوا ﷺ و منو عەبدولای کوڕی سەلام، جا(ﷲ)ی دەسەڵاتدارو بەشکۆ ئەم ئایەتەی دابەزاند لەبارەی ئەو داو دەفەرموێ:

(١٠) ئەی محمد ﷺ بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن (ﷲ)وە بێت‌و ئێوە باوەڕتان پێنەکردو یەکێك لە نەوەی یەعقوب کە عەبدولای کوڕی سەلام بو شایەتیدا لەسەر ڕاستی‌و دروستی ئەم قورئانە بە گوێرەی ئەو دیاری کردنەی تەورات جا ئەو خۆی باوەڕی هێنابێت، ئێوە هەر خۆتان بە زلگرت جگە لە خۆخەڵەتاندن چ شتێکی ترتان دەست دەکەوێت، بەڕاستی ئێوە بەم هەڵس‌و کەوتەتان ستەمکارن، بێگومان کە(ﷲ)یش ڕێنمایی گەلی ستەمکار ناکات،

(١١) جا ئەو کەسانەی کە خوا نەناسن بوون بەو مرۆڤە هەژارو کەمدەست‌و بیدەسەڵاتانەی کە باوەڕیان هێنابو، وەکو بیلال‌و ئالی یاسرو چەند کەسێکی تر لەو شێوانەیان دەوت: ئەگەر ئەم ئایینە شتێکی چاك بووایە ئەوانە پێشی ئێمە نەدەکەوتن بۆ باوەڕهێنان، جا کاتێك کە ڕێگای ڕاستیان پەیدا نەکردو بە هەڵەدا ڕۆیشتن، ئەوسا زۆر بە زووی دەڵێن: ئەم قورئانە هەڵبەستراوو درۆیەکی کۆنە؟!

(١٢) خۆ لە پێش ئەم قورئانەدا پەڕاوی موسایە کە پێشەواو خێربو بۆ خەڵکی سەردەمی خۆی، ئەم قورئانە پەڕاوێکە ڕاستەو دان دەنێت بە هەمو پەڕاوەکانی پێش خۆیداو هەمویان بەڕاست دەزانێت‌و بە زمانی عەرەبیە تا ئەو کەسانەی کە ستەم دەکەن

۞ وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ قَالُوٓا۟ أَجِئْتَنَا لِتَأْفِكَنَا عَنْ ءَالِهَتِنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٢٢﴾ قَالَ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَأُبَلِّغُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦ وَلَـٰكِنِّىٓ أَرَىٰكُمْ قَوْمًا تَجْهَلُونَ ﴿٢٣﴾ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا۟ هَـٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا ٱسْتَعْجَلْتُم بِهِۦ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ تُدَمِّرُ كُلَّ شَىْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا فَأَصْبَحُوا۟ لَا يُرَىٰٓ إِلَّا مَسَـٰكِنُهُمْ ۚ كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْقَوْمَ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدْ مَكَّنَّـٰهُمْ فِيمَآ إِن مَّكَّنَّـٰكُمْ فِيهِ وَجَعَلْنَا لَهُمْ سَمْعًا وَأَبْصَـٰرًا وَأَفْـِٔدَةً فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُمْ سَمْعُهُمْ وَلَآ أَبْصَـٰرُهُمْ وَلَآ أَفْـِٔدَتُهُم مِّن شَىْءٍ إِذْ كَانُوا۟ يَجْحَدُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٢٦﴾ وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا مَا حَوْلَكُم مِّنَ ٱلْقُرَىٰ وَصَرَّفْنَا ٱلْـَٔايَـٰتِ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٢٧﴾ فَلَوْلَا نَصَرَهُمُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ قُرْبَانًا ءَالِهَةًۢ ۖ بَلْ ضَلُّوا۟ عَنْهُمْ ۚ وَذَٰلِكَ إِفْكُهُمْ وَمَا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٢٨﴾

بترسێنێت لەسەر ئەنجامی ئەو ڕەفتارە پیسەیانو موژدەیش بدات بە چاکەکاران بەسەر بەرزی هەردوو ژیان.

﴿١٣﴾ بێگومان ئەو کەسانەی کە وتویانە ﷲ پەروەردگارمانەو پاشان لەسەر ئەو بیرو باوەڕو قسەیەی خۆیان ماون، ئەوسا هیچ ترسێك بۆ ئەوان نیەو لە ئاییندەشدا خەم ناخۆن.

﴿١٤﴾ ئەوانە بەهەشتینو هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، ئەمە پاداشتێکە بەوان دەدرێت بەهۆی ئەو کارو کۆششە بەنرخانەی کە لە دنیادا کردویانە. جا ئامۆژگاری مرۆڤ دەکات کە سپڵە نەبێتو لەگەڵ باوكو دایکیدا بە چاکی ڕەفتار بکاتو دەفەرموێ:

﴿١٥﴾ جا فەرمانمان دا بەسەر مرۆڤدا کە لەگەڵ دایكو باوکیدا چاکە بکات بەتایبەت دایك، چونکە دایکی لە سکیدا بە زەحمەت هەڵیگرتوە، وە بە زەحمەت بوویەتی، جا بە زەحمەتو ئێشو ژانیو هەڵگرتنیو بونیو لە مەمك برینەوەشی سی مانگی خایاندوە - کە ئەمانە هەموی بە زەحمەتو بەئێشو ژانو شەونخونی بۆ دایك تەواوبوە - تا بوو بە مرۆڤێکی بەهێزو گەیشتە چل ساڵ، وتی: ئەی پەروەردگارم وام لێبکە کە سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم کە داوتە بە خۆمو بە باوكو دایکمو ئیشی وابکەم کە تۆ ڕازی بکات و مندالّم بۆ چاك بکە، بێگومان من بۆ لای تۆ گەڕامەوەو بێگومان لە موسڵمانانم، واتە مسوڵمانی ڕاستەقینە دەبێت ئاوا چاك بێت لەگەڵ باوكو دایکیداو دوعای خێر بۆ ئەوانو نەوەی خۆیشی بکاتو هەمیشە ڕو لە خوا بێتو بە شانازیەوە خۆی بە یەکێك لە موسڵمانان دابنێت، جا پەروەردگار بەمانە دەفەرموێ:

﴿١٦﴾ ئەوانە کەسانێکن کە هەرچی ئیشی باشیان کردوە لێیان وەردەگرینو چاوپۆشی دەکەین لەو خراپانەی کە کردویانەو لە ڕۆژی قیامەتیشدا لەناو بەهەشتدا دەبن کە ئەمە بەڵێنە، بەڵێنێکی ڕاستی وا کە بەڵێنیان پێدراوەو بۆیان دێتەجێ، جا پەروەردگار کاتێك کە باسی مندالّی چاكو چاکەکار لەگەڵ باوكو دایکیدا و پاداشتەکەی کرد، ئینجاباسی مندالّی ناپەسندو نالەبار لەگەڵ باوكو دایکیدا دەکاتو دەفەرموێ:

﴿١٧﴾ جا ئەو کەسەی کە بە باوكو دایکی وت: وای بۆ ئێوە، ئایا بەڵێنی ئەوەم پێدەدەن کە من پاش مردن جارێکی تر زیندو دەکرێمەوە بۆ لێپرسینەوە، لە حالێکدا چەندین گەل لە پێش مندا هاتوونو مردونو هیچیان نەهاتونەتەوە؟! باسی چیم بۆ دەکەن؟! وە دایكو باوکیش هەر دەپاڕانەوە لە ﷲ کە ڕێنمایی بکات. وەدەیان وت: وای بۆ تۆ لەناو بچیت لەم قسەیەت پەشیمان بەرەوەو باوەڕ بکە بە زیندوبوونەوە، بێگومان بەڵێنی (ﷲ)یەو ڕاستە، جا دەیوت ئەم قسەیە هەر داستانە پڕوپوچەکانی کۆنە. لەفەرمودەداهاتوە کە یەزیدی کوڕی معاویە باسکرا لەلایەن مەروانەوە بۆئەوەی پەیمانی پێبدرێ، جا عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکر قسەیەکی پێ وت:.{ فَقَالَ خُذُوهُ فَدَخَلَ بَيْتَ عَائِشَةَ فَلَمْ يَقْدِرُوا فَقَالَ مَرْوَانُ إِنَّ هَذَا الَّذِي أَنْزَلَ اللَّهُ فِيهِ وَالَّذِي قَالَ لِوَالِدَيْهِ أُفٍّ لَكُمَا أَتَعِدَانِنِي فَقَالَتْ عَائِشَةُ مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فِينَا شَيْئًا مِنَ الْقُرْآنِ إِلَّا أَنَّ اللَّهَ أَنْزَلَ عُذْرِي/البخاري/ وتی: بیگرن، ئەویش چوە ماڵی خاتون عائیشەی خوشکیەوەو نەیانتوانی بیگرن، جا مەروان وتی: بەراستی ئەمە ئەو کەسەیە کەئەم ئایەتە دابەزیوە لەسەری﴿جا ئەو کەسەی کە بە باوكو دایکی وت: وای بۆ ئێوە، ئایا بەڵێنی ئەوەم پێدەدەن کە من پاش مردن جارێکی تر زیندو دەکرێمەوە بۆ لێپرسینەوە ...؟!﴾ جا خاتون عائیشە لەپشت پەردەوە وتی: خوا لەقورئاندا لەبارەی ئێمە هیچی نەناردوە بێجگە لەوەی کە خوا پاکانەی منی دابەزاند} پەروەردگاریش لە وەڵامی ئەم جۆرە کەسەو هاوشێوەکانیدا دەفەرموێ:

﴿١٨﴾ ئەوانە کەسانێکن کە بڕیاری ﷲ کە دۆزەخ پڕکرنە لێیان، بەهۆی لاساری خۆیانەوە چەسپاوە پێیانەوەو لە ناو تاقمو پێڕو گەلانێکن لەمرۆڤو جنۆکەی لەناوچوی پێش خۆیاندان کەبێگومان هەمویان ڕەنجەڕۆو زیان لێکەوتوون.

﴿١٩﴾ جا بۆ هەمویان لەجنۆکەو مرۆڤ پلەی جیاجیا هەیەو هەر کەسەی بەگوێرەی کرداری خۆی کەمو زۆر چاكو خراپ،

بەرهەمی ئەوكارانەی كە كردویانن وەردەگرن، خۆ ئەوان ستەمیان لێ ناكرێت نە بێباوەڕ تۆڵەی زیاتر لە تاوانی خۆی لێوەردەگیرێت‌و نە باوەڕدار لە چاكەكانی كەم دەكرێتەوە.

(٢٠) ئەوسا باس بكە ئەو ڕۆژەی كە ئەوانەی خوا نەناس بوون بەسەر ئاگریاندا دێن‌و پیشانیان دەدرێت، جا پێیان دەوترێت: لە ژیانی دنیادا خۆشیەكانی خۆتانتان بەسەربردوو بە باشی سودی خۆتانتان لێوەرگرت، جا ئەمڕۆ بە سزایەكی ناشیرین‌و سووك سزا دەدرێن بەهۆی ئەوەی كە ئێوە لەسەر زەویدا بە ناحەق خۆتان بەزل دەگرت، وەبەهۆی ئەوەی كە لە گاتان بگاردبوو لە خراپەو خراپەكاریدا.

(٢١) بەسەرهاتی برای عاد كە هودە ﷺ باسبكە بۆ گەلەكەت، بەڵكو پەندی لێوەربگرن ئەو كاتەی كە گەلەكەی خۆی لە ئەحقافدا ترساند بە سزای پەروەردگار ئەگەر بەگوێی نەكەن‌و چەندین ترسێنەری تریش پێش‌و پاش ئەویش بوون كە هەمویان وتویانە جگە لە ﷲ هیچ شتێكی تر مەپەرستن بەبێگومان من لە سزایەكی گەورە دەترسم كە لە ناكاودا بدات بەسەرتاندا، جا ئەوان لەباتی بیركردنەوەو پەیڕەوی كردنی هود زیاتر لەسەر خراپەی خۆیان سورتر دەبوون‌و باوەڕیان بە هود ﷺ نەكرد.

(٢٢) وتیان: ئایا بۆیە هاتویتە لامان كە لە بەندایەتی خوداكانمان لامان بدەیت؟ جا تۆ ئەگەر لە ڕاستگۆیانی دەی بیهێنە ئەو سزایەی كە هەڕەشەت پێكردوە لێمان.

(٢٣) ئەویش فەرموی: زانینی كاتی هاتنی ئەو سزایە هەر لەلای (ﷲ)یەو من هیچی لێ نازانم، وە ئەوەی كە بۆی ڕەوانە كراوم من بەئێوەم گەیاندوە، بەڵام من ئێوە بە گەلێكی نەزان دەبینم‌و فامی هیچ شتێكی باشتان نیە.

(٢٤) جا كاتێك كە بینیان هەورێك ڕووی كردۆتە شیوەكانیان بە خۆشیەوە وتیان: ئەمە هەورێكەو بارانمان بۆ دەبارێنێ، نەخێر ئەوە ئەو شتەبو كە پەلەتان بۆی دەكرد كە (بایە) و سزای بەژانی تێدایە بۆتان.

بەڵێ ئەو بایە بەبێپسانەوە حەوت شەوو هەشت ڕۆژ لێیدان،لە فەرمودەدا هاتوەكە خاتون عائیشە وتویەتی: { مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ ضَاحِكًا حَتَّى أَرَى مِنْهُ لَهَوَاتِهِ إِنَّمَا كَانَ يَتَبَسَّمُ قَالَتْ وَكَانَ إِذَا رَأَى غَيْمًا أَوْ رِيحًا عُرِفَ فِي وَجْهِهِ قَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الْغَيْمَ فَرِحُوا رَجَاءَ أَنْ يَكُونَ فِيهِ الْمَطَرُ وَأَرَاكَ إِذَا رَأَيْتَهُ عُرِفَ فِي وَجْهِكَ الْكَرَاهِيَةُ فَقَالَ يَا عَائِشَةُ مَا يُؤْمِنِّي أَنْ يَكُونَ فِيهِ عَذَابٌ عُذِّبَ قَوْمٌ

وَإِذْ صَرَفْنَا إِلَيْكَ نَفَرًا مِّنَ الْجِنِّ يَسْتَمِعُونَ الْقُرْآنَ فَلَمَّا حَضَرُوهُ قَالُوا أَنصِتُوا فَلَمَّا قُضِيَ وَلَّوْا إِلَىٰ قَوْمِهِم مُّنذِرِينَ ﴿٢٩﴾ قَالُوا يَا قَوْمَنَا إِنَّا سَمِعْنَا كِتَابًا أُنزِلَ مِن بَعْدِ مُوسَىٰ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ يَهْدِي إِلَى الْحَقِّ وَإِلَىٰ طَرِيقٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٣٠﴾ يَا قَوْمَنَا أَجِيبُوا دَاعِيَ اللَّهِ وَآمِنُوا بِهِ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُجِرْكُم مِّنْ عَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣١﴾ وَمَن لَّا يُجِبْ دَاعِيَ اللَّهِ فَلَيْسَ بِمُعْجِزٍ فِي الْأَرْضِ وَلَيْسَ لَهُ مِن دُونِهِ أَوْلِيَاءُ ۚ أُولَٰئِكَ فِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٣٢﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَلَمْ يَعْيَ بِخَلْقِهِنَّ بِقَادِرٍ عَلَىٰ أَن يُحْيِيَ الْمَوْتَىٰ ۚ بَلَىٰ إِنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٣٣﴾ وَيَوْمَ يُعْرَضُ الَّذِينَ كَفَرُوا عَلَى النَّارِ أَلَيْسَ هَٰذَا بِالْحَقِّ ۖ قَالُوا بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُوا الْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٤﴾ فَاصْبِرْ كَمَا صَبَرَ أُولُو الْعَزْمِ مِنَ الرُّسُلِ وَلَا تَسْتَعْجِل لَّهُمْ ۚ كَأَنَّهُمْ يَوْمَ يَرَوْنَ مَا يُوعَدُونَ لَمْ يَلْبَثُوا إِلَّا سَاعَةً مِّن نَّهَارٍ ۚ بَلَاغٌ ۚ فَهَلْ يُهْلَكُ إِلَّا الْقَوْمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٣٥﴾

٤٧ سُورَةُ مُحَمَّدٍ ٣٨

بِالرِّيحِ وَقَدْ رَأَى قَوْمٌ الْعَذَابَ فَقَالُوا هَذَا عَارِضٌ مُمْطِرُنَا/البخاري/ پێغەمبەری خوام ﷺ نەدیوە كەپێكەنیبێت ئاسمانگەی دەمی دەركەوتبێت ئەوهەر زەردەخەنەی بو، وتی: هەركاتێك هەورێك یان بایەكی ببینایە پێناخۆشی بەناوچاویدا هەست پێدەكرا وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان خەڵكی كەهەوردەبینن كەیفخۆش دەبن، هیوای ئەوەی لێدەكەن كە بارانی پێبێ، جا تۆ دەبینم هەر كاتێ دەیبینی پێناخۆشی بەناچاوتەوە دەزانرێت؟ جافەرموی: ئەی عائیشە چ شتێك دڵنیای كردوم كەسزای تێدا نیە؟ گەلێك بەبا سزادران، وەگەلێكیش سزایان دی، جا وتیان: ئەمە هەورێكەو بارانمان بۆدەبارێنێ }.

(٢٥) ئەو بایە بە فەرمانی پەروەردگاری خۆی ئەو شتەی كە بڕیاربو لەناوی ببات هەموی لەناوی برد، جا نە پیاو و نە ژن‌و نە گەورەو نە بچوك‌و نە سەروەت‌و سامان هیچی نەهێشتەوە تەنها هود ﷺ و ئەو كەسانەی كە باوەڕیان پێ هێنابو مانەوە. ئەوسا وایان لێهات تەنها جێگای ماڵەكانیان دەبینرا، هەر ئاوەها تۆڵە لە ستەمكاران وەردەگرین.

(٢٦) بە ڕاستی لەو شوێنەدا دەزگاو دوكان‌و هێزێكی وامان بەوان دابو كە بە ئێوەمان نەداوەو گوێچكەو چاوو عەقڵمان پێدان، ئەوسا نە گوێچكەیان‌و نە چاویان‌و نە عەقڵیان هیچ سودێكی بەوان نەدا چونكە ئەوان گاڵتەیان بە نیشانەكانی ﷲ

دەکرد، جا ئیتر سزای ئەوەی کە گاڵتەیان پێدەکرد دای بەسەریانداو ئاوا لەناوی بردنو کردنی بە پەندی ڕۆژگار (خوا بە لوتفی خۆی لە سزای دنیاو ئاخیرەت بمانپارێزێت) جا هەر کەسێك ﷲ سەرشۆڕی بکات کێ دەتوانێت بەهێزی بکات؟ ئەم باسانە هەموویان بۆ ئەم ئوممەتەیە تاواز بێنن لە دژایەتی قورئانو بەرنامە ڕاستەکەی ئیسلامو بگەڕێنەوە بۆلای ﷲ هەتا دەرگای تەوبەی لێدانەخراوە.

(٢٧)بە ڕاستی لە چواردەوری ئێوە گەلێك وڵاتمان لەناوبردو نیشانەکانی خومانمان زۆر گۆڕی بۆیان بەڵکو لەتاوانو خراپەکاری بگەڕێنەوە، بەڵام هەر لەسەر خراپەی خۆیان سووربوون تا وایان بەسەر هات.

(٢٨)سا ئەو کەسانەی کە ئەوان جگە لە ﷲ دەیانپەرستن تا بەهۆیەوە لە ﷲ نزیك ببنەوە دەی با بەدەمیانەوە بهاتنایەویارمەتیان بدانایە! بەڵکو هەر لێیشیان ونبون، وەئەوەش لەو درۆیانەن کە بۆ خۆیان هەڵیان بەستوە، کە گوایە دەگەنە فریامانو تکامان بۆ دەکەن لەلای ﷲ ؟! زۆر باوەڕدار هەیە هەر بەم شێوەیە لە ڕێگای ڕاست ترازاوەو چاوەڕوانی کەسانی ترن جگە لە پێغەمبەر ﷺ تکایان بۆ بکاتو نەیەڵێت بچنە ناودۆزەخەوەو لە پردی سیرات دەستیان بگرێت، بەڕاستی گەلێکی نەزانو نەفامنو بیر لەم قورئانە ناکەنەوەو خۆیانی لێگێل دەکەن. بیربکەنەوە تاکەی لەناو نەفامیدا دەخولێنەوە هەی نەزانان؟! پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ پاش ئەوەی کە لە مەککەدا دنیای لێ تەنگ بو چوو بۆ تائیف بەڵکو جێگایەك پەیدابکات بۆ خۆیو یارەکانیو بتوانێت ئازادانە ئەم بانگە پیرۆزەی ئیسلام بە خەڵك بگەیەنێت، بەڵام پاش قسەو گفتوگۆیەکی زۆر لەگەل سێ سەرپەرشتەکەی تائیفدا نەك هەر وەڵامی باشیان نەدایەوە بەڵکو لەکاتی گەڕانەوەیدا منداڵانیان لێ هانداو دایانە بەر بەردو برینداریان کرد، بەڵام ئەو زاتە دڵ گەورەو بە ڕەحمە نەك هەر دوعای شەڕی لێ نەکردن بەڵکو پاکانەی بۆ کردن لە نزا بە ناوبانگەکەیداو فەرموی: نازانن من پێغەمبەرم بۆیە وام لێدەکەن کە سیرەت نویسان بە درێژی ئەم باسەیان نوسیوەو لێرەدا نامانەوێت زیاتر درێژەی پێبدەین بەڵکو دەمانەوێت بڵێین: کە کاتێك گەڕاوە لە ڕێگادا لە (بەتنونەخلە) قورئانی دەخوێند کۆمەڵێك لە جنۆکە هاتنە لایو بە خۆیانیان وت: بێدەنگ بن کە نۆ کەس بوونو یەکێکیان زەوبیعە ناوێك بو

جا پەروەردگار ئەم ئایەتانەی دابەزاندوپێغەمبەری ﷺ لەڕووداوەکە ئاگادار کردەوەو فەرموی:

(٢٩)وەبیریان بهێنەوە ئەو کاتەی کە هەندێك لە جنۆکەکانمان ناردە لات کەگوێ لەم قورئانە بگرن، جا کاتێك کە ئامادەی لای تۆ بون لە ناوخۆیاندا وتیان: بێدەنگ بن جا کاتێك لەخوێندنەوەی بویتەوە ئەوان گەڕانەوە بۆلای گەلەکەی خۆیان کە ترسێنەر بون بۆیان بەسزای ﷲ ئەگەر باوەڕ بەم قورئانە نەکەن. جابەم شێوەیە ﷲ دڵی پێغەمبەریﷺ دایەوە، واتە ئەگەر لەوسەفەرەدا خەڵكێك نارەحەتیان کردیت و باوەڕیان پێنەهێنایت وا ئێمە کۆمەڵێك لە جنۆکەمان ناردە لاتو باوەڕیان هێناو بون بەبانگەوازکەر بۆپەیڕەوی کردن لەخۆتو لە بەرنامەکەت. جادەفەرموێ:

(٣٠)وتیان: ئەی خزمان بەڕاستی ئێمە پەڕاوێك کە پاش موسا ڕەوانە کراوەو دان دەنێت بەوەی کە لە پێش خۆیدا هاتوە بیستمان کە ڕێنمونی دەکات بۆ هەموشتێکی ڕەواو بۆ ڕێگای ڕاست،

(٣١)ئەی خزمان وەڵامی بانگەوازکەرەکەی ﷲ بدەنەوەو باوەڕی پێبکەن ﷲ لە تاوانباران خۆش دەبێتو لە سزای بەژان ڕزگارتان دەکات.

(٣٢)خۆهەر کەسێکیش وەڵامی بانگەوازکەرەکەی ﷲ نەداتەوە، ئەوسا ئەو لەم زەویەدا بۆ خۆ ڕزگار کردن هیچ دەرفەتێکی دەست ناکەوێت، وە جگە لەو زاتەش هیچ یارمەتی دەرو دۆستێکی نیە ئا ئەوانە لە گومڕاییەکی ئاشکرادان.

(٣٣)ئایا ئەوان هەروا لەسەر دژایەتی ئایینو پێغەمبەرﷺ سورنو نەیانزانیوە کە بێگومان ئەو (ﷲ)یەی کە ئاسمانانو زەوی دروستکردوە کە بۆ دروستکردنیشیان ماندو نەبوە دەتوانێت کە مردوان زیندو بکاتەوە؟ وانیە کەئەوان بیری لێدەکەنەوە، بێگومان کە ئەو زاتە توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیە. جارێکی تر قورئان دەمانباتەوە بۆ قیامەتو دەفەرموێ:

(٣٤) ئەوسا ئەو ڕۆژەی کە ئەو کەسانەی خوانەناس بوون لەسەر ئاگر ڕادەگیرێن و پێیان دەوترێت: ئایا ئەمە ڕاست نیە؟ دەڵێن: ڕاستە، سوێند بە پەروەردگارمان جا هەروەکو لە دنیادا قسەی بێ جێیان دەکرد لەوێش ئەم سوێندە بێ جێیەش دەخۆن چونکە داوای سوێندیان لێ نەکراوە گوایە دەیانەوێت بەزەیی ﷲ بۆخۆیان ببزوێنن؟! پەروەردگار دەفەرموێ: سا

بەهۆی ئەوەی کە خوانەناسبون ئەم سزایە بچەژن کە سزای ئاگرە (خوا پەنامان بدات). ئینجا پەروەردگار ڕوو لە پێغەمبەرمان ﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٥)تۆش هەروەکو پێغەمبەرە خاوەن عەزمو جەزمو کۆڵنەدەرەکان خۆت ڕابگرە وەکو چۆن ئەوان خۆیان ڕاگرت و پەلەی سزا مەکە بۆیان، چونکە ئەوان ئەو ڕۆژەی کە ئەو سزا بەڵێن پێدراوەیان چاو پێ کەوت وەکو ئەوە وان کە جگە لە کاتێکی زۆر کەمی ڕۆژێك لەم ژیانەدا نەبوون، ئا ئەمە ڕاگەیەنراوێکە دەبوایە پەندو ئامۆژگاریان لێوەرگرتایە، ئەوسا ئایا جگە لەو گەلەی کە لە سنور دەرچوون لە خراپەو تاواندا کەسێکی تر لەناو دەچێت؟ واتە هەر تاوانبار لەناو چوو ڕەنجەڕۆدەبێت، ئەمەش بەڵگەی دادگەری(اللهﷻ)ی باڵادەستە، ئەگەر کەسێك شایستەی سزا نەبێت سزا نادرێت.

## ٤٧ سورەتی محمدﷺ ٣٨

سورەتی (محمد) ﷺ کە سورەتی چلو حەوتەمی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە جگە لە ئایەتی ﴿ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ ... ﴾ محمد: ١٣. وە ئەم سورەتە سیو هەشت ئایەتەو بەسورەتی (القتال)یش ناو دەبرێت. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی نەوەدو شەش هەمینەو پاش سورەتی (الحديد) و پێش (الرعد) دابەزیوە. ناوی پێغەمبەرمان ﷺ بە(محمد) تەنها چوارجار هاتوە، کە لەم سورەتەو لە سورەتی(ئەحزاب) و (ئالی عیمران) و ( فەتح )دایە.

بەناویاللهﷻی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەو کەسانەی کە خوانەناس بوونو ڕێگای بڵاوبونەوەی ڕێبازیاللهﷻیان دەگرتو ببوون بە بەربەرچو دیوارێك لە ڕێگای گەیاندنی ئایینی ئیسلامدا خوا کردەوەکانیانی پوچەڵ کردەوە. واتەهەموئیشەخراپەکانیان بەزیانی خۆیان تەواوبو.

(٢) جا ئەو کەسانەش کە باوەڕیان هێناو کرداری چاکیان کردو باوەڕیان هێناوە بەوەی کە ڕەوانەکراوە بۆ محمد ﷺ کە قورئانە، ـ کە هەر ئەوەش تاکەرێبازی ڕاستە کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە بۆیان هاتوە ـ خوا خراپەکانی لەسەر لابردنو کاروباریشی بۆ ڕێکخستن، ئینجا هۆی هەڵوەشاندنەوەی کاری خوا نەناسانو وەرگرتنی کاری باوەڕداران باس دەکاتو دەفەرموێ:

(٣)ئەوەش بێگومان لەسەر ئەوەبو چونکە خوا نەناسان پەیڕەوی شتی پڕو پوچیان کردوەو بێگومانیش باوەڕداران

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ أَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَءَامَنُواْ بِمَا نُزِّلَ عَلَىٰ مُحَمَّدٖ وَهُوَ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّهِمۡ كَفَّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَأَصۡلَحَ بَالَهُمۡ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلۡبَٰطِلَ وَأَنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّبَعُواْ ٱلۡحَقَّ مِن رَّبِّهِمۡۚ كَذَٰلِكَ يَضۡرِبُ ٱللَّهُ لِلنَّاسِ أَمۡثَٰلَهُمۡ ﴿٣﴾ فَإِذَا لَقِيتُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَضَرۡبَ ٱلرِّقَابِ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ ذَٰلِكَ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ وَٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَن يُضِلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٤﴾ سَيَهۡدِيهِمۡ وَيُصۡلِحُ بَالَهُمۡ ﴿٥﴾ وَيُدۡخِلُهُمُ ٱلۡجَنَّةَ عَرَّفَهَا لَهُمۡ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ﴿٧﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعۡسٗا لَّهُمۡ وَأَضَلَّ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٩﴾ ۞ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ دَمَّرَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۖ وَلِلۡكَٰفِرِينَ أَمۡثَٰلُهَا ﴿١٠﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَأَنَّ ٱلۡكَٰفِرِينَ لَا مَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿١١﴾

پەیڕەوی ئەو ڕاستیانە کردوە کە لەلایەن پەروەردگاری خۆیانەوە بۆیان هاتوە، هەر ئاوەها اللهﷻ بۆ ئەم خەڵکە چەندین نمونەیان بۆ باسدەکات بەڵکو ژیر بنو پەیڕەوی ڕێگای ڕاستو دروست بکەن.

(٤)ئەوسا هەر کاتێك توشی ئەو خوا نەناسانە بون لە ملیان دەن، تا ئەو کاتەی کە تێکیان دەشکێننو لە دەستیان دەخەن ، جا ئیتر دیلەکانیان توند ببەستنەوەو پاشان یا بە منەتناو بێ بەرامبەر ئازادیان بکەن یان بەرامبەریان لێوەرگرن چ گیراو بە گیراو یان بە پارە ئەمەش دەبێت درێژەی هەبێت تا کاتێك شەڕ کۆتایی دێت واتە: ئیسلام شەڕ بۆیە دەکات کە شەڕ نەمێنێ، ئەوەیە بەرنامەی اللهﷻ بۆ مرۆڤ، خواناس بێ یان خوانەناس، ئەگەر اللهﷻ ئارەزۆی لێ بێت خۆی تۆڵە لە خوا نەناسان وەردەگرێت بەڵام ئەوە ناکات تا هەندێکتان بە هەندێکتان تاقی بکاتەوە تا دەرکەوێت باوەڕداران چەندە ڕاست دەکەن لەگەڵ ئایینی خۆیانداو چی بۆ دەکەنو خوا نەناسانیش چەندە دژایەتی ئایینی اللهﷻ دەکەنو خەڵکی باوەڕدار سزا دەدەن بۆ پاشەڕۆژ تا هەر کەس بۆ خۆی شایەت بێت لەسەر کردارەکانی خۆیو هیچکەس نەڵێ نەمزانی یان نەمتوانی، جا ئەو کەسانەی کە لە ڕێگای خوادا کوژراون ئەوسا هەرگیز ئیشەکانیان لێ ون ناکرێتو پاداشتی کارو کۆششی خۆیان پێدەدرێتەوە.

(٥)کەبەم زوانە ڕێگای ڕاستیان پیشان دەدات کە بیانگەیەنێتە بەهەشتو کاروباری ئەم ژیانەشیان بۆ سامان دەدات.

إِنَّ ٱللَّهَ يُدۡخِلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَتَمَتَّعُونَ وَيَأۡكُلُونَ كَمَا تَأۡكُلُ ٱلۡأَنۡعَٰمُ وَٱلنَّارُ مَثۡوٗى لَّهُمۡ ﴿١٢﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ أَهۡلَكۡنَٰهُمۡ فَلَا نَاصِرَ لَهُمۡ ﴿١٣﴾ أَفَمَن كَانَ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّهِۦ كَمَن زُيِّنَ لَهُۥ سُوٓءُ عَمَلِهِۦ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُم ﴿١٤﴾ مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ ﴿١٥﴾ وَمِنۡهُم مَّن يَسۡتَمِعُ إِلَيۡكَ حَتَّىٰٓ إِذَا خَرَجُواْ مِنۡ عِندِكَ قَالُواْ لِلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مَاذَا قَالَ ءَانِفًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡ ﴿١٦﴾ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ﴿١٧﴾ فَهَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّا ٱلسَّاعَةَ أَن تَأۡتِيَهُم بَغۡتَةٗۖ فَقَدۡ جَآءَ أَشۡرَاطُهَاۚ فَأَنَّىٰ لَهُمۡ إِذَا جَآءَتۡهُمۡ ذِكۡرَىٰهُمۡ ﴿١٨﴾ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ﴿١٩﴾

(٦)ئەوسا دەیانباتە ئەو بەهەشتەی کە لە دنیادا بۆی باسکردوون، جا کاتێك کە چونە ناویەوە هەر چۆنێك لەدنیادا جێگای خۆیان دەناسنەوە هەر ئاوەها لەوێش هەر کەسێك جێگای خۆی دەناسێتەوە.

(٧) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر ئێوە بەڕاستی یارمەتی ئایینی خودا بدەن خوداش یارمەتی ئێوە دەداتو پێتان لەسەر ڕێگای ڕاستو خودا پەرستی ڕاستەقینە بتەو دەکات. ئەگەر ئەمڕۆ یارمەتی نادرێین لەبەرئەوەیە کەئێمە یارمەتی حیزبودەستەوگرۆهـ دەدەین نەك ﷲ جل جلاله، باوەڕدار بیرکەرەوە بەسیەتی خۆوخەڵك فریودان.

(٨)جا ئەو کەسانەی کە خوا نەناس بون ئەوسا هەر لەناو چوونو ڕۆژ ڕەشی بەشیانەو خودا کردارەکانیانی پوچەڵ کردونەتەوە،

(٩)ئەوەش لەبەر ئەوەبو چونکە بەبێگومان ئەوان خۆشیان نەدەهات لەوەی کە خوا ڕەوانەی کردبو ئەوسا(ﷲ) یش کردارەکانیانی لێهەڵوەشاندنەوەو دەستیان لە هەمانەی خاڵیەوە دەرچوو.

(١٠)ئایا ئەوان بەم زەویەدا نەگەڕاون جا تەماشا بکەنو بزانن سەرئەنجامی خراپەکارانو گەنەکێلانی گەلانی پێش خۆیان چۆن بوەو چییان بەسەر هاتوە؟ کەﷲ تەفروتونای کردونو فەوتاندونی، خۆدەش فەرموێ: بۆ هەمو کافرێکی خوا نەناس لەهەمو کاتدا وێنەی ئەو سزایانە هەیەو چاوەڕوانیان دەکات.

(١١)ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە بێگومان ﷲ دۆستو یارمەتیدەری باوەڕدارانەو بێگومان خوا نەناسان دۆستو لایەنگریان نیە لەلایەن خوداوە.

(١٢)بێگومان کە ﷲ جل جلاله، ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە دەخاتە ناو باخچە گەلێکەوە کە بەناویاندا چەندین جۆگای پێدا دەڕوات.وە ئەو کەسانەش کە کافرو سپڵەو نمەك نەناس بوون ڕادەبوێرنو کەیف وخۆشی دەکەن لەدنیادا هەروەکو چوار پێیانیش دەخۆنو وا دەزانن هەر بۆ خەو و خواردن دروستبوون، ئەوسا ئەوانە ئاگر جێگایانە. لە فەرمودەدا هاتوە کە: {المُؤمِنُ يَأكُلُ فِي مِعىً واحِدٍ، والكَافِرُ يَأكُلُ فِي سَبعَةِ أَمْعَاءٍ/ متفق عليه/ باوەڕدار لە یەك ڕیخۆڵەوە خواردن دەخوات، وە خوانەناس لە حەوت ڕیخۆڵەوە دەخوات} .

(١٣)زۆر وڵات هەبوە کە زۆر بەهێزتر بوون لەو وڵاتەی کە تۆیان دەرکرد، جا ئێمە لەناومان بردن ئەوسا هیچ یارمەتیدەرێکیان نەبو کە لە دەست تۆڵەی ئێمە ڕزگاریان بکات واتە: تۆش خەم مەخۆ هەمان چارەنووس چاوەڕوانی ئەم گەلەیە کە تۆیان دەرکردوە لەمەکە. بەڵێ لەڕاستیدا زۆری پێ نەچوﷲ سەرانی کوفری هێنایە بەردەستی موسڵمانانو دروێنە کرانو زۆربەی سەرکردەکانیان لە غەزای بەدردا کوژران، یان بەدیل گیران. جا بەم شێوەیە ﷲ هەر لەم دنیادا پێش سزای دوارۆژیان سزای بچوکی دانو سەر شۆڕی کردن.

(١٤)ئایا ئەو کەسەی کە لەلایەن پەروەردگاری خۆیەوە لەسەر چاو ڕۆشنی بێت وەکو ئەو کەسە وایە کە کردارە خراپەکانی بۆ جوان کرابێت و پەیڕەوی لە ئارەزۆی خۆیان بکەن؟ ئاشکرایە کە ئەم دووانە وەك یەك نین **یەکەمیان**: نمونەی باوەڕدارانەو **دووهەمیان**: نمونەی خودا نەناسانە.

(١٥)وێنەی ئەو بەهەشتەی کە بە پارێزکاران بەڵێن دراوە ئا بەم شێوەیە کە لەناویدا چەندین جۆگای ئاوی تێدایە کە نەگۆڕاونو چەندین جۆگای شیری تێدایە کە ئەوانیش تامیان نەگۆڕاوەو چەندین جۆگای شەرابی تێدایە کە پڕ تامە بۆ ئەوانەی کەدەیخۆنەوەو چەندین جۆگای هەنگوینی پاڵفتەی تێدایە سەرەڕای ئەوەش لە هەمو بەروبومێکیان بۆ هەیەو چاوپۆشی پەروەردگاری خۆیشیان دەیانگرێتەوە، ئایا ئەو کەسەی

ئا لەم ژیانەدا بێت وەکو ئەو کەسە وایە کە هەمیشە لەناو ئاگردا بێتو ئاوی داخی وایان پێبدرێت کە ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە بکات؟ لە فەرمودەدا هاتوە کە: (ئەو هەنگوینە مێش نایکات) هەروەها لە فەرمودەیەکی تردا هاتووە کە: { سَيحَانُ وجَيحَانُ والنَيلُ وَالفُراتُ مِن أنهارِ الجَنَّةِ /مسلم وغیره/ سەیحانو جەیحانو نیلو فورات لە ڕوبارەکانی بەهەشتن}.

(١٦) جا لە ناو ئەوان دا کەسانێك هەن کە گوێت لێدەگرن تا لە لای تۆ دەچنە دەرەوە، جا چونکە هەر بە ڕواڵەت گوێیان گرتبو هیچ حاڵی نەبوون بۆیە کەدەرچون بەخوێندەوارانیان وت: ئەوە ئێستا محمد چی وت؟ ئا ئەوانە ﷲ مۆری ناوە بە سەر دڵیانداو هیچ شتێکی ڕاستو دروست وەرناگرنو پەیڕەوی لە ئارەزۆکانی خۆیان دەکەن نە تێگەیشتنیان چاکەو نە نیەتیان باشە.

(١٧) خۆ ئەو کەسانەی کە ڕێگای ڕاستیان گرتوە ﷲ زیاتر ڕێنماییان دەکاتو ترسی خۆی زیاتر دەخاتە ناو دڵیانەوەو ئەوانیش چاکتر ڕێگای بەختەوەری خۆیان دەگرن،

(١٨) ئەوسا ئایا ئەوان جگە لە هاتنی قیامەتێك کە بە کتوپڕی دێتە لایان چی تر چاوەڕێ دەکەن؟ ئەوەش بە ڕاستی نیشانەکانی هاتوە کە هاتنی پێغەمبەرمان ﷺ یەکێکە لە نیشانەکانیو پاش ئەو پێغەمبەرێکی تر نایەتو جیهان بەسەر ئەم گەلەدا وێران دەبێت، دەی چ سودێکی هەیە بۆیان بیرکردنەویان کاتێك کە قیامەت هاتو سزای کردارەکانیان یەخەی گرتن؟

(١٩) جا بزانە جگە لە ﷲ هیچ شتێکی تر شایستەی پەرستن نیەو بۆ گوناهی خۆتو بۆ باوەڕدارانیش چ پیاو و چ ژن داوای لێخۆشبوون بکە، ئەوسا ﷲ بە هەمو جوموجوڵێکی شەو و ڕۆژتان دەزانێو هیچی لێ ناشاردرێتەوە.لەفەرمودەدا کە عاسم لە عەبدوڵای کوڕی سەرجیسەوەهێناویەتی کە:{ قَالَ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ وَأَكَلْتُ مَعَهُ خُبْزًا وَلَحْمًا أَوْ قَالَ ثَرِيدًا قَالَ فَقُلْتُ لَهُ أَسْتَغْفَرَ لَكَ النَّبِيُّ ﷺ قَالَ نَعَمْ وَلَكَ ثُمَّ تَلَا هَذِهِ الْآيَةَ ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾ قَالَ ثُمَّ دُرْتُ خَلْفَهُ فَنَظَرْتُ إِلَى خَاتَمِ النُّبُوَّةِ بَيْنَ كَتِفَيْهِ عِنْدَ نَاغِضِ كَتِفِهِ الْيُسْرَى جُمْعًا عَلَيْهِ خِيلَانٌ كَأَمْثَالِ الثَّآلِيلِ/مسلم/وتویەتی: پێغەمبەری خوام ﷺ بینیو لە خزمەتیدا نانو گۆشت یان وتی: تریتم خوارد ، عاسم دەڵێ وتم: پێغەمبەر ﷺ داوای لێخۆشبونی بۆ کردیت؟ وتی: بەڵێ، وەبۆ تۆیش، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿بۆ گوناهی خۆتو بۆ باوەڕدارانیش چ پیاو و چ ژن داوای لێخۆشبوون بکە﴾ وتی: پاشان بەدەوریدا سوڕامەوە ئینجا تەماشای مۆری پێغەمبەرایەتیم کرد لەنێوانی هەردو

وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡلَا نُزِّلَتۡ سُورَةٞۖ فَإِذَآ أُنزِلَتۡ سُورَةٞ مُّحۡكَمَةٞ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلۡقِتَالُ رَأَيۡتَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يَنظُرُونَ إِلَيۡكَ نَظَرَ ٱلۡمَغۡشِيِّ عَلَيۡهِ مِنَ ٱلۡمَوۡتِۖ فَأَوۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٠﴾ طَاعَةٞ وَقَوۡلٞ مَّعۡرُوفٞۚ فَإِذَا عَزَمَ ٱلۡأَمۡرُ فَلَوۡ صَدَقُواْ ٱللَّهَ لَكَانَ خَيۡرٗا لَّهُمۡ ﴿٢١﴾ فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ﴿٢٢﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ﴿٢٣﴾ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَ أَمۡ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقۡفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِم مِّنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلۡهُدَى ٱلشَّيۡطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمۡ وَأَمۡلَىٰ لَهُمۡ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَالُواْ لِلَّذِينَ كَرِهُواْ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمۡ فِي بَعۡضِ ٱلۡأَمۡرِۖ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِسۡرَارَهُمۡ ﴿٢٦﴾ فَكَيۡفَ إِذَا تَوَفَّتۡهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَضۡرِبُونَ وُجُوهَهُمۡ وَأَدۡبَٰرَهُمۡ ﴿٢٧﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱتَّبَعُواْ مَآ أَسۡخَطَ ٱللَّهَ وَكَرِهُواْ رِضۡوَٰنَهُۥ فَأَحۡبَطَ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٢٨﴾ أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَن لَّن يُخۡرِجَ ٱللَّهُ أَضۡغَٰنَهُمۡ ﴿٢٩﴾

شانیدا لەجێگای جوموجوڵی شانی چەپی بو کە وەك هێلکەی کەو کەچەندین خاڵی وەك بالۆکەی لەسەربو}

(٢٠) خۆ باوەڕداران دەڵێن ئای سورەتێك بهاتایە بهاتایە خوارەوە فەرمانی غەزای تێدابوایە، جا هەر کاتێك سورەتێکی بتەو بهاتایەو باسی غەزای بکردایە تۆ دەبینی ئەو کەسانەی کە نخۆشی دووڕوویی لەناو دڵیاندایە وەکو کەسێك کە لە ترسی مردن بێهۆش بوبێت ئاوا تەماشات دەکەن ئەوەندە دەترسن لە جیهادو غەزا لە ڕێگای ﷲدا، خۆ چاکتر بۆ ئەوان ئەوەبو،

(٢١) کە بیبیان وتایە: گوێڕایەڵینوقسەی چاکیان بوتایە، جا هەرکاتێ فەرمانی غەزاش بدرێ جا با ڕاست بکەن لەگەڵ ﷲدا لە باوەڕو گوێڕایەڵیدا کە هەر ئەوە چاکە بۆیانو بە سودی خۆیانەوبەهرەی باشیان دەست دەکەوێت.

(٢٢) دەی بەراستی ئەگەر دەسەڵاتتان دەستکەوت، لەم زەویەدا خراپە بلاو دەکەنەوەو پەیوەندی خزمایەتی دەبچڕێنن؟ لە فەرمودەدا هاتوە کە:{لايَدخُلُ الجَنَّةَ قَاطِعٌ /مسلم/ ئەو کەسەی کە پەیوەندی خزمایەتی ببچڕێنێت ناچێتە بەهەشتەوە}.

(٢٣) ئەوانە کەسانێکن کەﷲ نەفرینی لێکردون ئەوسا کەڕوکوێر کردوون نە ڕاستی دەبیستنو نە ڕێگای ڕاست دەدۆزنەوە.

وَلَوْ نَشَآءُ لَأَرَيْنَٰكَهُمْ فَلَعَرَفْتَهُم بِسِيمَٰهُمْۚ وَلَتَعْرِفَنَّهُمْ فِي لَحْنِ ٱلْقَوْلِۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٠﴾ وَلَنَبْلُوَنَّكُمْ حَتَّىٰ نَعْلَمَ ٱلْمُجَٰهِدِينَ مِنكُمْ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَنَبْلُوَاْ أَخْبَارَكُمْ ﴿٣١﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَشَآقُّواْ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَىٰ لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيْـًٔا وَسَيُحْبِطُ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٣٢﴾ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَلَا تُبْطِلُوٓاْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ ثُمَّ مَاتُواْ وَهُمْ كُفَّارٌ فَلَن يَغْفِرَ ٱللَّهُ لَهُمْ ﴿٣٤﴾ فَلَا تَهِنُواْ وَتَدْعُوٓاْ إِلَى ٱلسَّلْمِ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ وَٱللَّهُ مَعَكُمْ وَلَن يَتِرَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ ﴿٣٥﴾ إِنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌۚ وَإِن تُؤْمِنُواْ وَتَتَّقُواْ يُؤْتِكُمْ أُجُورَكُمْ وَلَا يَسْـَٔلْكُمْ أَمْوَٰلَكُمْ ﴿٣٦﴾ إِن يَسْـَٔلْكُمُوهَا فَيُحْفِكُمْ تَبْخَلُواْ وَيُخْرِجْ أَضْغَٰنَكُمْ ﴿٣٧﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ تُدْعَوْنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبْخَلُۖ وَمَن يَبْخَلْ فَإِنَّمَا يَبْخَلُ عَن نَّفْسِهِۦۚ وَٱللَّهُ ٱلْغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلْفُقَرَآءُۚ وَإِن تَتَوَلَّوْاْ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمْثَٰلَكُم ﴿٣٨﴾

(٢٤) ئایا هەر بەرەو گومڕاهی دەچن‌و بیر لەم قورئانە ناكەنەوە؟ یان دڵەكان قفڵ كراون‌و هیچیان تێ ناچێت؟!

(٢٥) بەبێگومان ئەو كەسانەی كە پاشەو پاش گەڕانەوەو لەم ئاینە پەشیمان بونەوە پاش ئەوەی كە ڕێگایان بۆ ڕوون بویەوە، ئەوە شەیتانە كە ڕێگای خراپی لا جوان كردن‌و بەگوێچكەیانی چرپاندوە،

(٢٦) ئەوەش بۆیە شەیتان ئاوافێڵی لێكردوون چونكە بێگومان ئەوان بەو كەسانەی كە ئەم قورئانەیان خۆش نەدەویست وتوەكە الله هیچی ڕەوانە نەكردوە، بەم زوانە ئێمەش لە هەندێ كاروباری دژی ئەم ئایینەدا پەیڕەویتان دەكەین، تا ئەو جێگایەی كە بتوانین كارشكێنیش دەكەین ، ئەمە لە حاڵێكدایە كەالله ئاگادارە بە نهێنیەكانیان. قوڕیان بەسەر چەندە نەزان‌و بێ ئاگان كاتێ كەسزای خوا یەخەی گرتن چی دەكەن‌و بۆ كوێ دەچن؟

(٢٧) جا دەبێت چۆن بن ئەو كاتەی كە فریشتەكان گیانیان دەكێشن‌و لە دەم‌و چاو و پشتیان دەدەن،

(٢٨) ئەوەش لەبەر ئەوە بو چونكە بێگومان ئەوان پەیڕەوییان كرد لەو شتەی كە رقی الله ی هەڵدەسان‌و ڕازی بوونی ئەویان پێخۆش نەبو، ئەوسا هەمو كردارەكانیانی هەڵوەشاندنەوەو ئەوەی كە كردبویان وەكو بڵقی سەرئاوی لێهات‌و هیچ شوێنەوارێكی نەما.

(٢٩) یان وا دەزانن ئەو كەسانەی كە نخۆشی دوودڵی لەناو دڵیاندایە كە اللهئەو ڕق‌و قینەی ناو دەرونیان ئاشكرا ناكات‌و رسواو شەرمەندەیان ناكات؟!

(٣٠) خۆ ئەگەر ئێمە ئارەزۆمان لێ بێت ئەو دووڕووانە یەك بە یەك دیاری دەكەین بۆت، بەڵام ئەوەی نەكردوە جگە لە ژماریەكی كەمی كە باسیان هاتوە لە فەرمودەدا كە سی‌و شەش كەسی ناوبردوە پاش ئەوان فەرمویەتی تێتاندا هەیە ، جا لە خوا بترسن‌و كەسی تری ناو نەبردوە، خۆ ئەوانە ئەی محمدﷺ هەربە قسەكانیاندا دەیانناسیت، وەالله یش جل جلاله بەكردارەكانیان دەزانێت‌و ناتوانن هیچ نیەت‌و قسەو كردارێكی خۆیان لەو زاتە بشارنەوە.

(٣١) سا بە دڵنیاییەوە تاقیتان دەكەینەوە بە جیهاد تا بە زانیاریەكی ئاشكرا بۆمان دەربكەوێت ئەو كەسانەی كە جیهاد دەكەن لەناو ئێوەداو ئەو كەسانەش كە خۆگرن لەسەر غەزاو باقی كردارە چاكەكانی ترو خۆیان دەپارێزن لە گوناح، وەتا هەواڵی گوێڕایەڵی‌و سەرپێچی‌و ڕاستی‌و ناڕاستیتان دەربخەین بۆ خۆتان‌و خەڵكی دەوروبەرتان تا لە ڕۆژی قیامەتدا شایەتی بن لەسەر كردارەكانتان چاك یان خراپ.

(٣٢) بێگومان ئەو كەسانەی كە خوا نەناسن‌و ڕێگایان لە بڵاوبونەوەی ئایینی اللهگرت‌و دژایەتی پێغەمبەریش ﷺ دەكەن پاش ئەوەیش كە ڕێگای ڕاستیان بۆ ئاشكرا بو، هەرگیز ئەوانە زیانێك بە الله ناگەیەنن‌و بەم زوانە كردارەكانیان وەكو بڵقی سەر ئاو پوچەڵ دەكاتەوە. بەڵێ، یارەكانی پێغەمبەر ﷺ وایان دەزانی كە لەگەل وشەی (لا إله إلا الله/ هیچ پەرستراوێكی ڕاستەقینەی تر نیە بێجگە لە الله ) ئیتر گوناح زیانی نیە هەروەكو چۆن لەگەل شیركدا هیچ كردارێكی چاكە سودی نیە، جا ئەم ئایەتە دابەزی‌و سنوری بیروباوەڕی ڕۆشنتر كردەوەو فەرموی:

(٣٣) ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە پەیڕەوی لە زاتی اللهو پەیڕەوی لە پێغەمبەر ﷺ بكەن‌و كردارەكانتان پوچەڵ مەكەنەوە، واتە كرداری چاك كاتێك سودی هەیە كە مرۆڤ دژایەتی اللهو پێغەمبەرەكەی ﷺ نەكات نە بە كردارو نە بەوتارو نە بە نیەت ، جا ئەگەر بە یەكێك لەوانە دژایەتی كرد

لە ئیسلامەتی دەردەچێتو هەمو کردارێکی چاکیشی هەڵدەوەشێتەوە .

(٣٤) بێگومان ئەو کەسانەی کە کافرو دژ بە خوداو ڕێگری دەکەن لە بڵاوبونەوەی ئایینی ﷲ ، لە پاشان هەر بەو کافرییە دەمرن هەرگیز ﷲ لێیان خۆش نابێت. ئینجا پەروەردگار ڕوو لە باوەڕداران دەکاتو دەفەرموێ:

(٣٥) ئەوسا کە تووشی برینداریی‌و شەهادەتو تەنگ وچڵەمە بون لەسەر ئەم ئایینەی‌ﷲ لاواز مەبن‌و داوای شەڕ وەستاندن مەکەن ، لە کاتێکدا کە هەر ئێوە سەرکەوتون ، چونکە باوەڕتان بە ﷲهەیەو ﷲ یش لە گەڵتاندایە بە یارمەتیدان‌و بەهێزکردنتان، خۆ هەرگیز ﷲ کردارەکانتان کەمناکاتەوە ، بەڵکو زیاتر پیرۆزو بە پیتی دەکاتو جیگای خۆی بە باشی دەگرێت.

(٣٦) ژیانی دنیا هەر گەمەو گاڵتەو سەرگەرمیەکەو زۆر نابات لەناو دەچێت، ئەگەر باوەڕ بهێنن‌و لە خوا بترسن پاداشتان دەداتەوەو داوای ماڵتان لێ ناکات،

(٣٧) چونکە ئەگەر داواتان لێ بکاتو پێدابگرێت لەسەر ماڵ لێسەندنتان ئێوە ڕژدی دەکەن‌و ماڵ نابەخشن‌و ڕقو کینەتان سەبارەت بە ئایینی ئیسلام دەردەخات. بەڵێ: مرۆڤ ئاوایە سەبارەت بە خۆشەویستی ماڵ‌و سامان‌و کەسێکی خۆش ناوێت کە ماڵی لێ کەمبکاتەوە لە دنیادا مەگەر تاك تاك کەسانێك کە خوا دڵ‌و دەروونی فرەوان کردبن.

(٣٨) با هەمووتان چاك بزانن کە ئێوە بانگ دەکرێن بۆ ئەوەی ماڵ لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی ئایینی ﷲدا ببەخشن، جا لەناو ئێوەدا هەندێکتان ڕژدی دەکەن‌و ماڵ نابەخشن ، ئەوسا هەر کەسێکیش ڕژدی بکات خراپەی ئەو ڕژدیەی هەر خۆی دەگرێتەوەو ﷲ دەوڵەمەندەو ئێوەن هەژارو نیازمەند بە ﷲ جا ئەگەر ئێوە پشت لەو ئایینە بکەن ﷲ دەتان گۆڕێتەوە بە گەلێکی تری جگە لە ئێوە، پاشان ئەوان وەکو ئێوە ڕژدو خوانەناس نابن.

جا پێویستە کە باوەڕداران بە چاکی لەم ئایەتە پیرۆزە تێبگەن‌و بۆ خزمەتی ئایینی ﷲ کە مایەی خۆشبەختی مرۆڤە لە سەرو ماڵ دریغی نەکەن ئەگینا هەر وامان بەسەردێت کە ئەمڕۆ بەسەرمان هاتووە هەتا هەین هەمیشە خۆزگە بە پارە دەبین.

اللّهُمَّ ارِنَا الحَقَّ حَقّاً وَارزُقنَا إتبَاعَهُ-امین.

## سُورَةُ الفَتْحِ ٤٨ ٢٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا ﴿١﴾ لِّيَغۡفِرَ لَكَ ٱللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنۢبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكَ وَيَهۡدِيَكَ صِرَٰطٗا مُّسۡتَقِيمٗا ﴿٢﴾ وَيَنصُرَكَ ٱللَّهُ نَصۡرًا عَزِيزًا ﴿٣﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ فِي قُلُوبِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِيمَٰنٗا مَّعَ إِيمَٰنِهِمۡۗ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٤﴾ لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَيُكَفِّرَ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عِندَ ٱللَّهِ فَوۡزًا عَظِيمٗا ﴿٥﴾ وَيُعَذِّبَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ وَٱلۡمُشۡرِكَٰتِ ٱلظَّآنِّينَ بِٱللَّهِ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِۚ عَلَيۡهِمۡ دَآئِرَةُ ٱلسَّوۡءِۖ وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ وَلَعَنَهُمۡ وَأَعَدَّ لَهُمۡ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرٗا ﴿٦﴾ وَلِلَّهِ جُنُودُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٧﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَٰكَ شَٰهِدٗا وَمُبَشِّرٗا وَنَذِيرٗا ﴿٨﴾ لِّتُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُعَزِّرُوهُ وَتُوَقِّرُوهُۚ وَتُسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ﴿٩﴾

## سورەتی فەتح ٤٨ ٢٩

سورەتی فەتح کە سورەتی چل‌وهەشتەمی قورئانە، بیستو نۆ ئایەتە، لە سورەتە مەدینەییەکانەو لەساڵی شەشەمی کۆچی شەو لەکاتی گەڕانەوە لەئاشتەوایی حودەیبیەدا بەیەکجار هاتۆتە خوارەوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سەدوسیانزەهەمینە کە پاش سورەتی(الصف) پێش سورەتی (التوبة) دابەزیوە.

ساڵی شەشەمی کۆچی کە پێغەمبەرمان ﷺ خەونی بینی بو چونەتە ناو مەکەوەو هەندێك سەریان تاشی‌و هەندێکیان کورتیان کردەوەو بێترسبون، خەونی پێغەمبەرانیش لەسەری دەڕۆن مادام لەلایەن ﷲوە بەرگری نەکرێت، جا بۆ ئەو مەبەستە خۆی‌و هەزارو چوارسەد کەس لە یارەکانی بۆ عومرە بەرەو مەکە دەرچوون‌و ئیحرامی عومرەیان بەستو پێغەمبەرمان ﷺ حەفتا وشتری بە هەدیە بەرەو مەکە هێناو یارەکانیشی حەوت وشتریان هێنابو، جا کاتێك گەیشتنە (حودەیبیە) کە گوندێکە یەك قۆناغی دەمێنێت بۆ گەیشتنە مەکە بت پەرستانی مەکە پێیان زانین‌و ڕێگایان لێگرتن‌و لەوێ ئاشتەواییەك کرا لەسەر چەند خاڵێك یەکێکیان ئەوەبوو کە ئەمساڵ بگەڕێنەوەو ساڵی ئایندە بێنەوە بۆ عومرە کردن ، جا بت پەرستانیش ئەو کاتە تا سێ ڕۆژ دەوری مەکە چۆڵ بکەن‌و ئەوانیش لەو سێ ڕۆژەدا عومرەی خۆیان بکەن‌و بحەسێنەوەو پاشان مەکە چۆڵ بکەن، جا ئەوە بو لەو شوێنەدا ئیحرامیان

إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ فَوۡقَ أَيۡدِيهِمۡۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۖ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِمَا عَٰهَدَ عَلَيۡهُ ٱللَّهَ فَسَيُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١٠﴾ سَيَقُولُ لَكَ ٱلۡمُخَلَّفُونَ مِنَ ٱلۡأَعۡرَابِ شَغَلَتۡنَآ أَمۡوَٰلُنَا وَأَهۡلُونَا فَٱسۡتَغۡفِرۡ لَنَاۚ يَقُولُونَ بِأَلۡسِنَتِهِم مَّا لَيۡسَ فِي قُلُوبِهِمۡۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ بِكُمۡ ضَرًّا أَوۡ أَرَادَ بِكُمۡ نَفۡعَۢاۚ بَلۡ كَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرَۢا ﴿١١﴾ بَلۡ ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَنقَلِبَ ٱلرَّسُولُ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِلَىٰٓ أَهۡلِيهِمۡ أَبَدٗا وَزُيِّنَ ذَٰلِكَ فِي قُلُوبِكُمۡ وَظَنَنتُمۡ ظَنَّ ٱلسَّوۡءِ وَكُنتُمۡ قَوۡمَۢا بُورٗا ﴿١٢﴾ وَمَن لَّمۡ يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ فَإِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَعِيرٗا ﴿١٣﴾ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١٤﴾ سَيَقُولُ ٱلۡمُخَلَّفُونَ إِذَا ٱنطَلَقۡتُمۡ إِلَىٰ مَغَانِمَ لِتَأۡخُذُوهَا ذَرُونَا نَتَّبِعۡكُمۡۖ يُرِيدُونَ أَن يُبَدِّلُواْ كَلَٰمَ ٱللَّهِۚ قُل لَّن تَتَّبِعُونَا كَذَٰلِكُمۡ قَالَ ٱللَّهُ مِن قَبۡلُۖ فَسَيَقُولُونَ بَلۡ تَحۡسُدُونَنَاۚ بَلۡ كَانُواْ لَا يَفۡقَهُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿١٥﴾

لابرد وهەدیەكانیان سەربڕیو سەریان تاشیو پاشان بە داخو خەمێكی زۆرەوە بەرەو مەدینە گەڕانەوە ، ئەوسا پەروەردگار ویستی دڵنەوایی پێغەمبەرەكەی بكاتو ئەو دڵتەنگیو پەژارەیەیان لەسەر لابدات، شەو لە شیوێك لە بەردەم(عوسفان) لەنێوان (مەكە)و (مەدینە)دا ئەم سورەتە هەتا كۆتاییەكەی دابەزی، پێغەمبەرمانیﷺ شادمان كردو ئەویش موژدەی بە یارەكانی داو فەرمووی: ئەمشەو سورەتێكی قورئانم بۆ هاتووە كە خۆشترە لەلام لە هەموو شتێكو پاشان خوێندییەوە: ﴿إِنَّا فَتَحۡنَا لَكَ فَتۡحٗا مُّبِينٗا﴾ بێگومان ئێمە سەركەوتن چ سەركەوتنێكی ئاشكرامان بە تۆدا. جا یارەكانی فەرموویان عافیەتو نۆشی گیانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بە حەقیقەت ﷲ ڕۆشنی كردووە كەچی بۆ تۆ دەكات، ئەی چی بۆ ئێمە دەكات؟ جا ئایەتی ﴿لِّيُدۡخِلَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾ ی بۆخوێندنەوە تا گەیشتە ﴿فَوۡزًا عَظِيمٗا﴾. جا با لەگەڵ ئایەتەكانی ئەم سورەتە بەتامەدا هێواش هێواش هەنگاو هەڵگرینولەتامو چێژەكەی بچەژین:

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بێگومان ئێمە سەركەوتنمان پێدایت بەسەركەوتنێكی ئاشكرا. عەبدوڵای كوڕی مەسعود دەڵێت: خەڵك سەركەوتنی مەكە بەو سەركەوتنە دادەنێن بەڵام ئێمە ئاشتەوایی حودەیبیە بەو سەركەوتنە دەزانین چونكە لەوێوە سەركەوتن دەستی پێكرد، بەڵێ پەروەردگاری ئەمەی بۆ كرد

(٢) تا ﷲ لە هەڵەكانی پێشووتو لەو هەڵانەیش كە لەمەودواش توشت دەبێت چاوپۆشی بكاتو خێرو چاكەی خۆییت بۆ تەواو بكاتو ڕێگای ڕاستت پیشان بدات. لەفەرمودەدا هاتوە كە موغیرە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ئەوەندە بەشەو نوێژەوە خەریك دەبو تا هەردوو پێیەكانی ئاوسا بو جا عەرزی كرا كە: ئەی خوا لە كوناحی پێش وپاشت خۆش نەبوە؟ فەرمووی:{ أَفَلَا أَكُونُ عَبۡدًا شَكُورًا /البخاري/ دەی ئیتر نابێ منیش بەندەیەكی سوپاسگوزاربم؟}

(٣) جا تا ﷲیارمەتیت بدات بە یارمەتیدانێكی وا كە ببیت بە خاوەن دەسەڵاتو سەرت بخات بە سەركەوتنێكی گەورەو شەرافەتمەندانە.

(٤) ﷲ ئەو زاتەیە كە ئارامی خستە ناو دڵی باوەڕدارانەوە تا لەگەڵ ئەو باوەڕەی كە هەیانە باوەڕیان زیاترو بەهێزتر بكات.وەسەربازەكانی ئاسمانانو زەوی موڵكی ﷲیە، وەﷲ زاناو كار بەجێیەو هەمو بڕیارەكانی پڕ خێروچاكەیە بۆ خەڵك.

(٥) جا تا ئەو سەركەوتنە بكات بەهۆی ئەوەی كە پیاوانی باوەڕدارو ئافرەتانی باوەڕدار بخاتە ناو باخچەگەلێكەوە كە بەناویدا چەندین جۆگا تێدەپەڕێت، كەبۆ هەمیشە تێیداو خراپەكانیان بۆ دادەپۆشێتو هیچیان ئاشكرا نەكات وئابڕوویان نەبات كە ئەوە لەلایەن ﷲ جل جلاله بۆ ئەوان سەركەوتنو خۆشبەختیەكی گەورەیە.

(٦)جا تا بەو سەركەوتنە ئاشكرایە پیاوانی دووڕوو و ئافرەتانی دووڕوو، وە پیاوانی هاوەڵ دانەرو ئافرەتانی هاوەڵ دانەر سزا بدات، ئەوانەی كە گومان دەبەن بە ﷲ بە گومانێكی خراپو وادەزانن كە محمدﷺ هەرگیز سەرناكەوێتو ئەو موژدەو دڵخۆشیانەی دەیكات ڕاست دەرناچێت، بێگومان خراپیان بەسەر هاتووەو ڕۆژگاری خراپ هەر بەسەر ئەواندا دەسوڕێتەوەو ﷲ ڕقی هەستاوە لێیانو نەفرینی كردونو دۆزەخیشی ئامادەكردوە بۆیان، ئەوسا چارەنوسێكی ڕەشو خراپیان هەیە.

(٧) خۆسەربازانی ئاسمانانو زەوی هەرموڵكی خودانو خودایش دەسەڵاتدارو كار بەجێیە.

(٨) بێگومان ئێمە تۆمان ناردوە كە لە ڕۆژی قیامەتدا شایەت بیت لەسەر ئوممەتەكەتو لە دنیادا موژدەی بەهەشت بدەیت بە چاكەكارانیانو خراپەكارانیان بە سزای دۆزەخ بترسێنی،

(٩) تا باوەڕبكەن بە بوونو دەسەڵاتو یەكتای اللهو ڕاستی پێغەمبەرەكەی ﷺ و یارمەتی بدەن و ڕێزی بۆ دابنێنو بەیانیانو ئێواران یادی الله بكەن بە (سبحان الله).

(١٠) بەڕاستی ئەو كەسانەی كە پەیمانت لەگەڵ دەبەستن ئەوە هەروەكو ئەوە وایە كە پەیمان لەگەڵ اللهدا ببەستن دەستی الله بە بەهێزكردنو خۆگریان لەسەر دەستی ئەواندایە ، جا هەر كەسێك ئەو پەیمانە بشكێنێت، زیانی ئەو پەیمان شكاندنە هەر بۆ خۆیەتیو هەر كەسێكیش ئەو پەیمانە بباتەسەر بەو شێوەی كە لەگەڵ خوادا بەستویەتی بەم زوانە خودا پاداشتی گەورەی پێدەدات، بەڵێ: ئەو ڕۆژەی كە ئەم پەیمانە بەسترا لەگەڵ پێغەمبەرمان ﷺ یارەكانی هەزارو چوارسەد كەس بون، هۆی بەستنی ئەم پەیمانە ئەوە بو كە كاتێك بت پەرستانی مەكە ڕێگایان بە پێغەمبەرﷺ و یارەكانی گرت لە (حودەیبیە) پێغەمبەری خواﷺ عوسمانی كوڕی عەفانی (خەلیفەی سێهەم پاش وەفاتی خۆشەویست) نارد بۆ مەكە بۆ ڕێك كەوتن، عوسمان لە هاتنەوەكەیدا بەهۆی درێژی وتووێژەكەوە دواكەوتو پڕوپاگەندەش بڵاوبویەوە كە گوایە عوسمانیان شەهید كردوە، پێغەمبەریشﷺ یارەكانی كۆكردەوەو فەرموی: كێ پەیمانم پێدەدات لەسەر مردن؟ جا یارەكانی هەمویان هاتنو پەیمانیان پێدا لەژێر درەختێكدا كە لەپاشدا باسی دێت جا پێغەمبەرمانﷺ فەرموی: ئەی خودایە بێگومان عوسمان لە ئەنجامدانی ئەركێكی پێویستی اللهو پێغەمبەرەكەیدایە، جا دەستێكی خۆی دا بە دەستەكەی تری لەجیاتی عوسمانداو پەیمانی عوسمانیشی بەوشێوە وەرگرت، ئاشكرایە كە دەستی پێغەمبەر ﷺ بۆ عوسمان باشترە لە دەستی ئەوان بۆ خۆیان، بەڵێ ئەوە پەیمانێك بو لەسەر مردنو ڕاستیان كرد بۆیە پەروەردگار لەپاشدا شایەتی ڕاستیو باوەڕیان بۆ دەدات.

(١١) ئەو عەرەبە كۆچەریانەی كە دوا كەوتبون لە دەرچون بۆ غەزا لەگەڵ پێغەمبەرداﷺ و لە ناو ماڵو خێزانی خۆیان دانیشتنو خۆ خەریك كردن بە كارو كۆششو ژیانیان هەڵبژارد بەسەر دەرچوون بۆ عومرە بەم زوانە دەڵێن: سەروەتو سامانو خاو خێزانمان خەریكی كردینو دەستی ئێمەی گرت لە دەرچون بۆ عومرە، جا تۆ داوای لێخۆشبونمان بۆ بكە كە ئەمانە بە زمان شتێك دەڵێن كە لەناو دڵیاندا وانیە بەڵكو خۆ بواردنو ترس لە مردنو ئیسراحەت ویستن وای لێكردن كە دەرنەچن، جا بڵێ: ئەگەر الله بیەوێت زیانێك یان سودێك بە ئێوە بگەیەنێت چ كەسێك هەیە كە توانای شتێكی هەبێ بۆتان؟ نەخێر وانیە كە

قُل لِّلْمُخَلَّفِينَ مِنَ الْأَعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إِلَىٰ قَوْمٍ أُولِي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلُونَهُمْ أَوْ يُسْلِمُونَ ۖ فَإِن تُطِيعُوا يُؤْتِكُمُ اللَّهُ أَجْرًا حَسَنًا ۖ وَإِن تَتَوَلَّوْا كَمَا تَوَلَّيْتُم مِّن قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذَابًا أَلِيمًا (١٦) لَّيْسَ عَلَى الْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ ۗ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ ۖ وَمَن يَتَوَلَّ يُعَذِّبْهُ عَذَابًا أَلِيمًا (١٧) ۞ لَّقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ السَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَابَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا (١٨) وَمَغَانِمَ كَثِيرَةً يَأْخُذُونَهَا ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا (١٩) وَعَدَكُمُ اللَّهُ مَغَانِمَ كَثِيرَةً تَأْخُذُونَهَا فَعَجَّلَ لَكُمْ هَٰذِهِ وَكَفَّ أَيْدِيَ النَّاسِ عَنكُمْ وَلِتَكُونَ آيَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ وَيَهْدِيَكُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا (٢٠) وَأُخْرَىٰ لَمْ تَقْدِرُوا عَلَيْهَا قَدْ أَحَاطَ اللَّهُ بِهَا ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرًا (٢١) وَلَوْ قَاتَلَكُمُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوَلَّوُا الْأَدْبَارَ ثُمَّ لَا يَجِدُونَ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا (٢٢) سُنَّةَ اللَّهِ الَّتِي قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلُ ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا (٢٣)

ئەوان دەڵێن: الله زۆر لێزانە بەو شتەی كە ئێوە دەیكەنو ناتوانن هیچی لێ بشارنەوەو بە قسەی بێ ناوەرۆكتان فێڵی لێ ناكرێت.

(١٢) بەڵكو ئێوە واتان گومان دەبرد كە پێغەمبەر ﷺ و باوەڕدارانێك كە لەگەڵی دەرچون هەرگیز ناگەڕێنەوە بۆ ناو ماڵو خێزانی خۆیانو هەمویان دەكوژرێنو شەیتان ئەو هەڵوێستە چەپەڵەی بۆ جوان كردنو گومانتان دەبرد بە گومان بردنێكی خراپ كە یان هەمویان دەكوژرێن یان گومانیان دەبرد كە پێغەمبەر ﷺ ڕاست ناكاتو دەیان قسەی پڕوپوچی تر كە ناوبەناو لە قورئاندا قسەكانیان باسكراوە، وەئێوە گەلێكی فەوتاو و لەناوچوون بەهۆی ئەو گومانە خراپانەتانەوە.

(١٣) ئەوسا هەر كەسێك باوەڕی بە خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ نەهێنابێت ئەوە كافرو خوانەناسەو بێگومان ئێمەیش بۆ خوانەناسان ئاگری بڵێسەدارمان ئامادەكردوە.

(١٤) خۆئاسمانانو زەوی هەمویان موڵكی اللهی باڵادەستە، كەچاوپۆشی دەكات لەو كەسەی كە ئارەزۆی لێ بێت ئەگەر باوەڕدار بێتو سزای ئەو كەسەیش دەدات كە ئارەزۆی لێ بێت كە سەرجەم هەموكافرانەو ئەو باوەڕدارانەیشە كە شایستەی چاوپۆشی الله نەبن، جاالله لێبوردەو بێنیهایەت میهرەبانە سەبارەت بە بەندەكانی.

(١٥) ئەو كەسانەی كە بەبۆنەی دنیا پەرستیو ترسان لە مردن دواخران هەركاتێك ئێوە بڕۆن بۆ ئەوەی دەستكەوتێك

وَهُوَ ٱلَّذِي كَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ عَنۡهُم بِبَطۡنِ مَكَّةَ مِنۢ بَعۡدِ أَنۡ أَظۡفَرَكُمۡ عَلَيۡهِمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٢٤﴾ هُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ وَٱلۡهَدۡيَ مَعۡكُوفًا أَن يَبۡلُغَ مَحِلَّهُۥۚ وَلَوۡلَا رِجَالٞ مُّؤۡمِنُونَ وَنِسَآءٞ مُّؤۡمِنَٰتٞ لَّمۡ تَعۡلَمُوهُمۡ أَن تَطَـُٔوهُمۡ فَتُصِيبَكُم مِّنۡهُم مَّعَرَّةُۢ بِغَيۡرِ عِلۡمٖۖ لِّيُدۡخِلَ ٱللَّهُ فِي رَحۡمَتِهِۦ مَن يَشَآءُۚ لَوۡ تَزَيَّلُواْ لَعَذَّبۡنَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿٢٥﴾ إِذۡ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ فَأَنزَلَ ٱللَّهُ سَكِينَتَهُۥ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَعَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَأَلۡزَمَهُمۡ كَلِمَةَ ٱلتَّقۡوَىٰ وَكَانُوٓاْ أَحَقَّ بِهَا وَأَهۡلَهَاۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ﴿٢٦﴾ لَّقَدۡ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءۡيَا بِٱلۡحَقِّۖ لَتَدۡخُلُنَّ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمۡ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَۖ فَعَلِمَ مَا لَمۡ تَعۡلَمُواْ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتۡحٗا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾ هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا ﴿٢٨﴾

وەرگرنەوە لە خوانەناسان بە زووی دەڵێن:لێمان گەڕێن ئێمەیش دێین لەگەڵتاندا، دەیانەوێت قسەی اللّٰه بگۆڕن کە فەرمویەتی: نەیانبەن لەگەڵ خۆتاندا مادام لەسەرەتاوە خۆیان بواردوە لە هاتنە دەرەوە ئێستایش پێیان دەفەرموێ: بڵێ هەرگیز لەگەڵ ئێمەدا نایەن، چونکە اللّٰه وای بریار داوە لە پێشدا ئەوسا بەزوویی دەڵێن: نەخێر قسەی اللّٰه نیە، بەڵکو ئێوە ئیرەییمان پێدەبەنو حەز ناکەن ئێمە سودێکمان دەست کەوێت، نەخێر وانیە کە ئەوان دەڵێن، بەڵکو ئەوان هەر کەم تێدەگەن.

﴿١٦﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ: بەو عەرەبە کۆچەریانەی کە خۆیان لەو دەرچونە بە پاشدا بەم زوانە بانگ دەکرێن بۆلای گەلێکی جەنگاوەری بەهێز کە یان هەرشەریان لەگەڵدا دەکەن یان خۆیان بەدەستەوە دەدەن ، جا ئەگەر پەیرەویتان کرد لەو فەرمانەو بەرەو ئەو گەلە جەنگاوەرە بەهێزە ڕۆیشتن ئەوە اللّٰه پاداشتێکی جوانتان پێدەدات، ئەگەر دیسانیش پشتتان تێکرد وەکو لە پێشەوە پشتتان ـ لە فەرمانی دەرچون بۆ عومرە ـ کرد ئەوە سزاتان دەدات بە سزایەکی پڕ ژان. بەڵێ پەروەردگار لە بڕیارەکانیدا کەسی لەبیر ناچێتو تاوانبارو بێتاوانی لەلا یەکسان نیە ، لێرەدا کەسانێك هەن کە دەرنەچوون بۆ عومرە یان لێرەش ناتوانن بۆ ئەم جەنگەیش دەربچن بەڵام بەهانەی شەرعیان هەیە ئەوانەی لەو سزایە جیاکردۆتەوەو دەرفەرموێ:

﴿١٧﴾ بەراستی تاوان نە لەسەر کوێرو نە لەسەر شەل و نە لەسەر نخۆش نیە لەسەر بەشدار نەبونیان لە غەزادا چونکە توانایان نیە، ئەوسا هەرکەسێك پەیڕەوی لە خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، خوا دەیخاتە ناو باغاتێکەوە کە بەناویدا چەندین جۆگا دەڕواتو هەر کەسێکیش پشت بکات لە فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ سزای دەدات بە سزایەکی بەژان.

﴿١٨﴾ بە حەقیقەت اللّٰه لەو باوەڕدارانە ڕازی بو کە لەژێر درەختەکەدا پەیمانیان بە تۆدا کە شەڕ لەگەڵ بت پەرستانی قوڕەیشدا بکەن، جا اللّٰه زانی کە ئەوانە چی لە ناو دڵیاندایە لە ڕاستیو ئەنجامدانی پەیمانەکانیان ، ئەوسا ئیتر ئارامیی پێدانو هێوری کردنەوە بە سەرکەوتنێکی نزیکیش کە سەرکەوتنی خەیبەر بو پاداشتی ئەو سەفەرەو ئەو خەمو خەفەتەی دانەوە. جا ئەبوبەکرو عومەر لەو پەیماندانەدا ئامادەبونو پێغەمبەر ﷺ دەستی خۆی دانا لەجیاتی عوسمانداودەقی ئەم ئایەتە ڕونترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستیو دروستی ئەو موسڵمانانە بە گشتیو ئەو سێ هاوەڵە بەتایبەتی، بەڵام دەست پەروەردەکانی جولەکە بۆتۆڵەسەندنەوە لەئایینی ئیسلام لەماڵی پێغەمبەرﷺ و یارە بەرێزەکانیەوە ـ خوا لە هەمویان ڕازی بێت ـ دەستیان داوەتە دوژمنایەتی کردنو بختیانو قسەی ناڕەوا وتن بەوان و بەناو ئایینەوە شەوو ڕۆژ نەفرینیان لێدەکەن کە بەراستی ئەم کارە ناپەسەندەیان دژایەتی دەقی قورئانەوبەڵگەی بێباوەڕبونیانە بەپێغەمبەرﷺ و بەقورئانو بە ئاینی ئیسلام.

﴿١٩﴾ جا دەستکەوتانێکی زۆر کە دەستیان دەکەوێتواللّٰه دەسەڵاتدارو کار بەجێیەو ئەوسودەچاکەتان پێدەدات.

﴿٢٠﴾ خوٌ اللّٰه بەڵێنی دەستکەوتێکی زۆری پێداون کە دەستتان دەکەوێت ، جا ئەمەتان بۆ پێش دەخات کە خەیبەرەو دەستی خەڵکتان لێدەگرێت کە دەست درێژی بکەنە سەرتان، تا ئەمەش ببێت بە نیشانەیەکی مەزن بۆ باوەڕدارانو ڕێنماییتان بکات بۆ ڕێگای ڕاست بەهۆی گوێڕایەڵیتان بۆ فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ.

﴿٢١﴾ ئەوسا دەستکەوتی تریشتان پێدەدات کە ئێوە هیچ تواناییەکتان نەبوە بەسەریدا لە حاڵێکدا خوا چواردەوری داوەو خوایش بەسەر هەمو شتێکدا توانایی هەیە.

﴿٢٢﴾ جا ئەوانەی کە خوا نەناسبون ئەگەر شەڕیشیان لەدژتان بکردایە، چاك بزانن کە ئەوان پشتیان تێدەکردو ڕایان دەکرد

پاشان هیچ دۆستو یارمەتیدەرێکیان دەست ناکەوێت کە لایەنگریان لێ بکاتو یارمەتیان بدات.

(٢٣) ئەمە باوی خودایە کە سەرئەنجام ستەمکاران لەناو بباتو پارێزکاران سەربخاتو کافرو خوا نەناسانیش تەفروتونا بکات کە باوێکی کۆنەو هەر وابووەو لەمەولاش هەروا دەبێت هەرگیز نابینیت کە ئەم باوەی خوا بگۆڕیت. بەراستی ئەمە مژدەیەکی دڵ فێنك کەرەوەیە بۆ باوەڕداران کە خۆگرو بە ئارامبن لە کارو کۆششی خۆیانداو لە زەبرو زۆری دوژمن نەترسن سەرئەنجام خوا نەناس لەناو دەچێتو دەفەوتێتو پارێزکار سەرکەوتوو بەهرەمەند دەبێت.

(٢٤) جا اللّٰه ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە دەستی ئەوان پاراستو ئەوانیشی لە دەست ئێوە پاراستو نەیهێشت هیچ جەنگو لێکدانێك ڕووبدات لە شیوی مەکەدا پاش ئەوەی کە ئێوەی زاڵکرد بەسەر ئەواندا، دەڵێن: لە کاتی (حودەیبیە)دا حەفتا، یان هەشتا کەس بە چەکەوە لە (تەنعیم) هێرشیان هێنا بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان، بەڵام پێش ئەوەی دەست بکەنەوە دەستگیر کرانو پاشانیش ئازادیان کردن، ئینجا ئەم ئایەتە دابەزیو پاشان فەرموی: اللّٰه جل جلاله، بینەری ئەو کردارانەیە کە ئێوە دەیکەن، بەڵێ ئەوەیە لێبوردنی ئایینی خودا لە خوا نەناسان بەڵام ئەگەر موسڵمانان دەست ئەوان بکەوتنایە چییان پێدەکردن؟ ئینجا دەفەرموێ:

(٢٥) هەر ئەوان بون کە لە ئایینی خودا لایانداو ڕێیان بە ئێوە نەدا کە بچنە کەعبەوەو قوربانیەکانیشتان ڕاگیرانو نەگەیشتنە شوێنی خۆیان کە حەرەمی مەکەیە جائەگەر لەبەر پیاوانی باوەڕدارو ئافرەتانی باوەڕداری ناوشاری مەکە نەبوایە کە نەتان دەناسینو پێ پرنەتان بکردنایە و بەبێ زانیاری دوچاری گوناھ بونایە، ماوەمان پێدەدان بچنە ناو شارەوەو دژیان جەنگ بکەن بەڵام لەبەر ئەو مەبەستە گەورەیە ڕێگامان پێنەدان بچنە ناو شارەوەو دژیان جەنگ بکەن، تا اللّٰه هەر کەسێك ئارەزۆی لێ بێت بیخاتە ناو خێرو چاکەی خۆیەوە، جا ئەگەر ئەوان جیا بوونایەوە لەو خوا نەناسانە بێگومان ئێمە ئەو دین دوژمنانەی ئەوانمان سزا دەدا بە سزایەکی پڕ ئێش‌وژان.

(٢٦) ئەو کاتەی کە خوانەناسان لەناو دڵیاندا دەمارگیری هەبو دەمارگیرییەکی نەزانانەو ڕێگای چوونە مەکەیان لە پێغەمبەر ﷺ و یارەکانیان لە (حودەیبیە) گرت، ئەوسا اللّٰه ئارامیو هێواشی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ وبە باوەڕداران بەخشیو وشەی تەقواو پارێزکاری پێویست کرد لەسەریانو وای چەسپاندن پێیەو تامردن جیا نەبێتەوە لێیان. هەندێك وشەی تەقواوی بە (لا إله إلاّ الله) مانا کردووە کە لە ڕاستیدا کەسێك پارێزکارە کە ئەو یەکخوا پەرستیەی لەم وشەدایە بەتەواوی لێی حاڵی بوبێتو لەکرداریدا رەنگ بداتەوە نەك ئەوەی کە ئەمڕۆ ئێمە بەزمان دەیڵێین بەڵام هەمو هەڵسو کەوتێکمان دژایەتی کردنیەتی، جا بەڕاستی ئەوان شایستەتر بون لە هەمو کەس بەو پەرهیزکاریەو گونجاوتر بون بۆیو چاك لە مانای (لا إله إلاّ الله) تێگەیشتبون، خۆ خودایش زانیاری بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو هیچ شتێك لە زانیاری ئەو دەرناچێت. ئەم یارە بەرێزانەی بەشایستەی هەڵگرتنی ئەم پەیامەی زانین بۆیە پێی سپاردن ـ خوا لە هەموبان رازی بێت ـ ودوژمنانیان بێ نرخو رسوا بکات.

(٢٧) بەڵێ کە ئاشتەوایی (حودەیبیە) کراو گەڕانەوەو خەونەکەی پێغەمبەرمان ﷺ ئەوساڵە نەهاتەدی باوەڕداران زۆر دڵتەنگو ناڕەحەت بوون، ئاشکرایە کەدووڕووەکانیش ئەم هەلەیان وەکو کاتەکانی تر قۆستوەتەوەو لە دژی پێغەمبەر ﷺ و ئایینە بەنرخەکەی ئیسلام دەستیان داوەیە پڕوپاگەندەی ژاراوی، خواش بەم ئایەتە لەدەمی ئەوانی داوەو باوەڕدارانیشی دڵخۆشکردوە کە دەفەرموێ: بەراستی خودا ئەو خەونەی پێغەمبەری ﷺ هێنایەدی، کە هێشتا نەبوە اللّٰه بە ڕابردوو باسی دەکات چونکە ئەوەندە ڕاستەو دێتەدی، وە دەفەرموێ: بێگومان دەچنە مزگەوتی حەرامەوە کە بەیتە ئەگەر خوا ئارەزۆی لێ بێت (ئەم وشە لێرەدا بۆ بەستنەوە نیە بەڵکو بۆ فێرکردنی ئێمەیە لە بەکار هێنانی ئەم وشە پیرۆزەداو بۆ پیرۆزی لێرەدا هێنراوە) چونکە ئەو چونە ئەوەندە مسۆگەرە پێشەکی بە(لام)و پاشان بە (نون)ی دوویات کردوەتەوەو داکۆکی لەسەر چوونە ناو مەکە کردوە کەبێتڕس دەبن، جا هەندێکتان سەرتان دەتاشنو هەندێکی ترتان کورتی دەکەنەوە، هەرگیز ناترسن لەو شوێنەدا ، خۆ ئەو زاتە شتانێك دەزانێت لەم ئاشتەواییەدا کە ئێوە نایزانن جا لەباتی ئەوخەمو ناڕەحەتیەدا سەرکەوتنێکی نزیکی بۆ داناون کە سەرکەوتنی خەیبەربو، بەڵێ ئەم خەونە لە ساڵی حەوتەمی کۆچی(پاش ساڵێك) ڕێكو ڕاست هاتە دی.

(٢٨) هەر ئەو زاتەیە کە پێغەمبەری خۆی ﷺ بە ڕێنمونیی کەرو بەئایینی ڕاست ناردوە تا سەری بخات بەسەر تەواوی ئایینو بەرنامەی تردا، وەخوا بەسە کە شایەت بێت بۆیان، ئینجا پەروەردگار لە وەسفی پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی دا دەفەرموێ:

مُّحَمَّدٌ رَّسُولُ ٱللَّهِۚ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ أَشِدَّآءُ عَلَى ٱلۡكُفَّارِ رُحَمَآءُ بَيۡنَهُمۡۖ تَرَىٰهُمۡ رُكَّعٗا سُجَّدٗا يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٗاۖ سِيمَاهُمۡ فِي وُجُوهِهِم مِّنۡ أَثَرِ ٱلسُّجُودِۚ ذَٰلِكَ مَثَلُهُمۡ فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِۚ وَمَثَلُهُمۡ فِي ٱلۡإِنجِيلِ كَزَرۡعٍ أَخۡرَجَ شَطۡـَٔهُۥ فَـَٔازَرَهُۥ فَٱسۡتَغۡلَظَ فَٱسۡتَوَىٰ عَلَىٰ سُوقِهِۦ يُعۡجِبُ ٱلزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ ٱلۡكُفَّارَۗ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنۡهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمَۢا ﴿٢٩﴾

## سُورَةُ الحُجُرَاتِ ٤٩ ١٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٞ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرۡفَعُوٓاْ أَصۡوَٰتَكُمۡ فَوۡقَ صَوۡتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجۡهَرُواْ لَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ كَجَهۡرِ بَعۡضِكُمۡ لِبَعۡضٍ أَن تَحۡبَطَ أَعۡمَٰلُكُمۡ وَأَنتُمۡ لَا تَشۡعُرُونَ ﴿٢﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُنَادُونَكَ مِن وَرَآءِ ٱلۡحُجُرَٰتِ أَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿٤﴾

﴿٢٩﴾ محمدﷺ پێغەمبەری خودایەو ئەو کەسانەی کە لەگەڵیدان زۆر توندو تیژن بەرامبەر بەکافرانی دین دشمنو میهرەبانن لەناو خۆیاندا، تۆ دەبینیت کە زۆر رکوعو سوجدە دەبەنو نوێژی زۆر دەکەنو چاکەو رەزامەندی خودایان دەوێت. بەهۆی زۆری سوجدە بردنیانەوە، نەرمو نیانیو خۆ بەکەمگرتن لە دنیاداو سپێتیو روناکی لە قیامتدا بەناو چاوانیانەوە دیارە، ئەمە وێنەی ئەوانە لە تەوراتدا، خۆ لە ئینجیلیشدا نمونەیان وەکو کشتوکاڵێکە کە سەوز بووبێتو جا بەهێزی بوبێت ، ئەوسا ئەستور بووبێتو لەسەر لاسکو بنجی خۆی وەستا بێت کە جوتیارەکان لە جوانیو شینایی ئەو کاتە سەریان لێ سوورِ بمێنێت. وە بەم شێوەیە کافرە خوانەناسەکان خەمبارتر دەکات. خودا بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان کردوە بەڵێنی لێبوردنو پاداشتی گەورەی داوە کە بەهەشتی هەتا هەتاییە. ئابەم شیوەیە ﷲ وەسفی یارانی پێغەمبەر خۆشەویستمان ﷺ دەکات. کەخۆی زەرعەکەیەو یارەکانی لقوپۆپەکەیە کە سەرەتا لە کەمیو لاوازیەوە دەستیان پێکرد پاشان زۆربوون پاشان بە جوانترین شێوە بەهێز بونو بوون بەباشترین یارمەتیدەری ئەم ئایینە. جا ﷲ کافرانی پێداخدار کرد. ئیمامی مالیك ئەم ئایەتەی خوێندەوە جا فەرموێ: هەرکەس لە دڵی دا بەرامبەر بەیەکێك لە یارانی پێغەمبەر رق وکینەیەکی هەبێت بەری ئەم ئایەتەدەکەوێت کە ﷲناحەزانی ئەسحاب بەکافر وەسف دەکات. پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە یارانی دەفەرموێ:{ لَا تَسُبُّوا أَصْحَابِي فَلَوْ أَنَّ أَحَدَكُمْ أَنْفَقَ مِثْلَ أُحُدٍ ذَهَبًا مَا بَلَغَ مُدَّ أَحَدِهِمْ وَلَا نَصِيفَهُ }/البخاري/ جنێو نەدەن بەیارەکانم ئەوسا سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بە دەستە هەر کام لە ئێوە بە ئەندازەی چیای (ئوحد) چاکە بکات هێشتا ناگات بەئەندازەی نیو مشتی ئەو } بەڵام دوژمنانی ئایین کەداخ لە دڵن بۆ یارانی پێغەمبەرمان ﷺ سەبارەت بەو کەڵە پیاوە بەڕیزانە قسەی نا ماقوڵ دەکەن لەکاتێکدا کە خوا خۆی شایەتی چاکترین کەسیان بۆ دەدات لەناوئەم ئوممەتەدا ﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ ..الاية﴾ آل عمران: ١١٠.

## سورەتی حوجورات ٤٩ ١٨

سورەتی حوجورات کە سورەتی چلونۆهەمی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، هەژدە ئایەتە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سەدوهەشتەمەو پاش سورەتی (المجادلة) و پێش (التحريم) دابەزیوە.

بەناویﷲ ی زۆر بەسۆز وبێنیهات میهرەبان

﴿١﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە بە خواو پێغەمبەرﷺ نە بە قسەو نە بە کردار پێش بڕیاری خوداو پێغەمبەرﷺ نەکەونو لە خوا بترسن بێگومان خودا بیسەری هەمو قسەکانتانەو زانەری هەمو کردارو نیەتەکانتانە. لە فەرمودەدا هاتوە کە:{ أَنَّهُ قَدِمَ رَكْبٌ مِنْ بَنِي تَمِيمٍ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ أَمِّرِ الْقَعْقَاعَ بْنَ مَعْبَدِ بْنِ زُرَارَةَ قَالَ عُمَرُ بَلْ أَمِّرِ الْأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ قَالَ أَبُو بَكْرٍ مَا أَرَدْتَ إِلَّا خِلَافِي قَالَ عُمَرُ مَا أَرَدْتُ خِلَافَكَ فَتَمَارَيَا حَتَّى ارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا فَنَزَلَ فِي ذَلِكَ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُقَدِّمُوا حَتَّى انْقَضَتْ }/البخاری/ وتراوە کە وەفدێکی (بەنی تەمیم) هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و ئەبوبەکر وتی: قەعقاعی کوڕی مەعبەدی کوڕی زوراره بکە بە سەرپەرشتیان، عومەر وتی: نە با ئەقرەعی کوڕی حاریس بێ، ئەبوبەکر وتی: مەبەستت دژایەتی منە ، ئەویش وتی : نەخێرو جا قسەیان تێکگیرا تا دەنگیان بەرزبویەوە جا لەوبارەوە ﴿ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە نە بە قسەو نە بە کردار پێش بڕیاری خوداو پێغەمبەرﷺ نەکەون...تاکۆتای ئایەتەکە﴾ دابەزی.

﴿٢﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز مەکەنەوەو بە دەنگی بەرز وەکو هەندێکتان لەگەڵ هەندێکتاندا قسە دەکەن ئاوا قسە لەگەڵ ئەودا مەکەن نەوەکو هەمو کردارەکانتان هەڵوەشێتەوەو ئێوە هەستی پێ نەکەن، پوچەڵ کردنو هەڵوەشاندنەوەی کردەوە چاکەکان

سزای ئەو کەسەیە کە بەس دەنگی بەسەر دەنگی پێغەمبەردا ﷺ بەرز دەکاتەوە ، جا سزای ئەو کەسە دەبێ چۆن بێت کە بیرو بۆچونی خۆی بە سەر فەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ بەرزدەکاتەوە؟ پاشان پەروەردگار ئەو کەسانە وەك ئەبوبەکرو عومەر کە لە پاش هاتنی ئەم ئایەتانەوە دەنگیان لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ زۆر نزم دەکردەوە مەدح دەکاتو دەفەرموێ:

(٣) بێگومان ئەو کەسانەی کە لەلای پێغەمبەری خوادا ﷺ دەنگی خۆیان نزم دەکەنەوە، ئەوانە کەسانێکن کە خوا دڵی ئەوانی تاقیکردوەتەوەو لەخواترسیو پارێزکاری پێداون، بۆ ئەوان لێبوردنو پاداشتی گەورە هەیە. جا سەبارەت بەو کەسانەیش کە نەزانانە وەکو چۆن لە دەرەوەی هۆدەکانەوە بانگی یەکتریان دەکرد ئاوەها بانگی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد دەفەرموێ:

(٤) بێگومان ئەو کەسانەی کە لە دەرەوەی هۆدەکانەوە بانگی پێغەمبەر ﷺ دەکەنو دەڵێن: هۆ محمد، ئەوانە زۆربەیان هەست بە چاكو خراپ ناكەن.

لەفەرمودەدا لەبارەی ئەم ئایەتەوە لەبەرائی کوڕی عازیبەوە هاتوە کەوتویەتی: { فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ حَمْدِي زَيْنٌ وَإِنَّ ذَمِّي شَيْنٌ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ ذَاكَ اللَّهُ /الترمذي.صححه الالباني/ پیاوێك هەستاو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێگومان سوپاسکردنم بۆخەڵك جوانەو بێگومان لۆمەکردنیشم خراپە. جا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە تەنها ئیشی خودایە}

(٥) جا ئەگەر ئەوان خۆیان بگرتایە تا پێغەمبەر ﷺ دەردەچوو بۆ ناویان، ئەوسا قسەیان لەگەل بکردایە بێگومان ئەوە زۆر چاکتربو بۆیان، بەلام ئەوان وایان نەکردو نەزانانە بانگی پێغەمبەریان ﷺ دەکرد، لەگەل ئەوەشدا دوو سیفەتی خۆی باس ئەکات تا هیوادارییان بکاتو لەرەحمی ئەو زاتە نائومێد نەبن، دەفەرموێ: ﷲ لێبوردەیە لە تاوانی بەندەکانیو بێنیهایەت میهرەبانە. جا با واز لەو جۆرە هەڵسوکەوتە نابەجێیانە بهێنن و داوای لێبوردن لەو پەروەردگارە میهرەبانەیان بکەن.

(٦) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەگەر فاسقێك هەواڵێکی بۆ هێنان زوو باوەڕی پێ مەکەن ، بەڵکو هەوڵی ڕۆشن بوونەوەی ئەو هەواڵە بدەن نەوەك بە هەڵوێستێکی نەزانانە تاقمێك توشی بەلا بکەن ، ئەوسا لە سەر ئەو هەڵوێستەی کە بە قسەی ئەو فاسقەتان کردوە پەشیمان ببنەوە.

(٧) جا بزانن بێگومان پێغەمبەری خواتانﷺ لەناو دایە، ئەگەر لە زۆر شتێکدا بە گوێی ئێوە بکات بێگومان دوچاری

وَلَوْ أَنَّهُمْ صَبَرُوا حَتَّىٰ تَخْرُجَ إِلَيْهِمْ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ ۚ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ (٥) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِن جَاءَكُمْ فَاسِقٌ بِنَبَإٍ فَتَبَيَّنُوا أَن تُصِيبُوا قَوْمًا بِجَهَالَةٍ فَتُصْبِحُوا عَلَىٰ مَا فَعَلْتُمْ نَادِمِينَ (٦) وَاعْلَمُوا أَنَّ فِيكُمْ رَسُولَ اللَّهِ ۚ لَوْ يُطِيعُكُمْ فِي كَثِيرٍ مِّنَ الْأَمْرِ لَعَنِتُّمْ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الْإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ وَكَرَّهَ إِلَيْكُمُ الْكُفْرَ وَالْفُسُوقَ وَالْعِصْيَانَ ۚ أُولَٰئِكَ هُمُ الرَّاشِدُونَ (٧) فَضْلًا مِّنَ اللَّهِ وَنِعْمَةً ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (٨) وَإِن طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا ۖ فَإِن بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَى الْأُخْرَىٰ فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّىٰ تَفِيءَ إِلَىٰ أَمْرِ اللَّهِ ۚ فَإِن فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا ۖ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ (٩) إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ (١٠) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰ أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ وَلَا نِسَاءٌ مِّن نِّسَاءٍ عَسَىٰ أَن يَكُنَّ خَيْرًا مِّنْهُنَّ ۖ وَلَا تَلْمِزُوا أَنفُسَكُمْ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ ۖ بِئْسَ الِاسْمُ الْفُسُوقُ بَعْدَ الْإِيمَانِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (١١)

تەنگوچەڵەمەو دەردەسەری دەبن بەلام خودا باوەڕهێنانی لەلاتان خۆشەویست کردو لە دڵتاندا جوانی کردو کفرو فاسقیو تاوانی لەلاتان ناشرین کرد، جا ئا ئەوانەن شارەزاو تێگەیشتو. جا بەگوێکردنی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەو کەڵە پیاوانەی کە پێشەوایانی هەمو ئومەتن لەو سەردەمدا موسڵمانانی دوچاری زەحمەت دەکرد، دەتۆ بڵێی بەگوێ کردنی خەڵکانی ئەمڕۆ وگوێ نەدان بەفەرمودەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ حاڵمان خۆشتر بێت لەئەمڕۆ؟ زۆرن بەناو ئایینەوە لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا دژی سەدان فەرمودەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بەناو زانینی فیقهی واقیعەوە رەفتار دەکەن ؟! هەندێك لەدین بەدنیافرۆشان وتویانەودەڵێن: زانایانی راست تێکوڵی ئایین دەزانن بەلام شێخانی ئێمە ناوەرۆکی دەزانن؟!!وائەمڕۆ کەسانی تر بەناو فیقهی واقیعەوە بێترسانە دژایەتی فەرمودەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ دەکەنو هەندێکیش بۆ خۆ رزگارکردن لەئایینوتێکدانی بیروباوەڕی خەڵك هەرلەفەرمودە رادەکەنو دەڵێن: قورئان بەسە، قسەیەکی راستەو مەبەستێکی خراپ، چونکە بەبێ فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هیچ بەندایەتیەك ناتوانرێ ئەنجام بدرێ. سەرجەمی ئەم بۆچونانە هەڵەیەو لادانە لەوئایینەی کە خوا بۆ ئەم گەلەی ناردوەوتابیعومەتبوع سەرلێشێواوگومراهن، خواهەمومان ڕێنمایی بکات بۆرێگای راست. بۆ زیاتر رونبونەوە تەماشای ئایەتی چلوچواری (نەحل) بکە.

(٨) ئەمەش ڕێزگرتن و چاکەیەکە لەلایەن اللَّهُ ـەوە کەماوەنادات مرۆڤ بەکەیفی خۆی بەرنامەی ژیان بۆ خۆی دابنێت. وەاللَّهُ زۆر زانایە بەو کەسانەی کە شایستەی ڕێنمایی یان گومڕایین و دانایە لە فەرمودەو کردارەکانیداو لە ئەندازەگیری و بەرنامەکەیداو هەموی بەسودی مرۆڤە ئەگەر بە چاکی پەیڕەوی بکات.

(٩) ئەوسا هەر کاتێك دوو تاقم لە باوەڕداران بەگژیەکدا چوون ئەو کاتە ئێوە ئاشتەوایی لە نێوانیاندا بکەن ، جا ئەگەر یەکێکیان دەستدرێژی کردە سەر ئەویتریان ئەو کاتە ئێوەش بەگژ ئەو تاقمەدا بچن کە دەستدرێژی دەکەن هەتا دەگەڕێتەوە بۆ بڕیاری اللَّهُ و ئامادەی ئاشتەوایی و ملکەچی حەق دەبێت، جا ئەگەر ملکەچی فەرمانی اللَّهُ بو ئەوسا ئێوەیش بە دادپەروەرانە لە نێوانیاندا ئاشتەوایی بکەن و دادپەروەر بن بەبێگومان خودا دادپەروەرانی خۆش دەوێت. جا تەماشا بکەن کەاللَّهُ چەندەدژی ناکۆکی وشەڕی نێوان باوەڕدارانەو ڕازی نیە کە ئەوجۆرە ڕەفتارە لەناوموسڵماناندا درێژەی هەبێت و فەرمانی داوەکە لەگەل درێژە پێدەراندا شەڕبکرێت تا لەو کردارە خراپەی خۆیان دەست هەڵدەگرن، چونکە بەو ناکۆکی و شەڕو هەرایە لاوازدەبن و دوژمن بەسەریاندا زاڵ دەبێت.

ئەنەس دەڵێ: { قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ لَوْ أَتَيْتَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أُبَيٍّ فَانْطَلَقَ إِلَيْهِ النَّبِيُّ ﷺ وَرَكِبَ حِمَارًا فَانْطَلَقَ الْمُسْلِمُونَ يَمْشُونَ مَعَهُ وَهِيَ أَرْضٌ سَبِخَةٌ فَلَمَّا أَتَاهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ إِلَيْكَ عَنِّي وَاللَّهِ لَقَدْ آذَانِي نَتْنُ حِمَارِكَ فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ مِنْهُمْ وَاللَّهِ لَحِمَارُ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ أَطْيَبُ رِيحًا مِنْكَ فَغَضِبَ لِعَبْدِ اللَّهِ رَجُلٌ مِنْ قَوْمِهِ فَشَتَمَهُ فَغَضِبَ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا أَصْحَابُهُ فَكَانَ بَيْنَهُمَا ضَرْبٌ بِالْجَرِيدِ وَالْأَيْدِي وَالنِّعَالِ فَبَلَغَنَا أَنَّهَا أُنْزِلَتْ وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا/البخاري/ بەپێغەمبەر ﷺ وترا خۆزگە سەرێکی لای عەبدوڵای کوڕی ئوبەیت بدایە، جا پێغەمبەر ﷺ سواری گوێرێژێك بو چو بۆ لای و کۆمەڵێك لەیارانی لەگەڵدا دەرۆیشتن و زەوییەکی بەردەڵان بو، جا کاتێ پێغەمبەر ﷺ هاتە لای وتی: دوربکەوەرۆ لێم بەخوابۆنی گوێرێژەکەت ئازاری دام ، جا پیاوێك لە وان لەیاریدە دەرەکان وتی: بەخوا گوێرێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆنی لەتۆ خۆشترە ، جا پیاوێك لەخزمانی عەبدوڵا لەسەر عەبدوڵا ڕقی هەستاو قسەی پێ وت، ئینجا بۆ هەریەکێ لەوان یارەکانیان ڕقیان جوو جا لەنێوانیاندا لێدان بەدارو دەست و نەعل روی دا ، جا ئەوەی کەپێمان گەیشتوە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەو دووتاقمەوە دابەزیوە} بزانە کە هۆی دابەزین، ئایەت تایبەت ناکات.

(١٠) بێگومان باوەڕداران هەر برای یەکن جا ئاشتەوایی لە نیوان براکانتاندا بکەن و ماوە بە شەیتان و شەیتان سیفەتان مەدەن کە دوورتان بخاتەوە لە یەك و لە خوا بترسن بەڵکو ڕەحمتان پێبکات. لە فەرمودەدا هاتوە کە{الْمُؤمِنُ لِلمؤمِنِ كالبُنيَان يَشُدُّ بَعضُهُ بَعضاً وَشَبَّكَ بَينَ أصابِعِهِ/متفق عليه/ باوەڕدار بۆ باوەڕدار وەکو بیناو ساختمانن هەندێکیان هەندێکیتریان بتەو و بەهێزتر دەکات و دەبن بەهوی بەهێزبونی یەکتر( جا پێغەمبەر ﷺ بۆ پیشاندانی چۆن پشتگیری کردن لە یەك) پەنجەکانی بە ناویەکدا کرد} وەهەروەها دەفەرموێ:{ أَلاَ أُخْبِرُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ كَثِيرٍ مِنْ الصَّلَاةِ وَالصَّدَقَةِ قَالُوا بَلَى قَالَ إِصْلَاحُ ذَاتِ الْبَيْنِ وَإِيَّاكُمْ وَالْبِغْضَةَ فَإِنَّهَا هِيَ الْحَالِقَةُ/ابوداود، صححه الألباني/ ئایا ئاگادارتان نەکەمەوە بە چاکەیەك لە زۆرکردنی نوێژی سونەت و سەدقە؟ وتمان بەڵێ، فەرموی: ئاشتەوای دروستکردن لەنێوان خۆتاندا، جا خۆتان بپارێزن لە ڕق و قین کە بێگومان ئەوە لابەری بیروباوەڕو کارەچاکەکانتانە } تەنانەت پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {ليسَ الكَذّابُ الذي يُصْلِحُ بَيْنَ النّاسِ فَيَنمي خَيْراً، أو يَقولُ خَيْراً/ متفق عليه/ بە درۆزن ناژمێردرێت ئەو کەسەی کە ناوبژی بکات لە نێوان خەڵکدا، قسەی چاك بگوازێتەوە یان قسەی چاك بکات کە ڕاست نەبوبێت، بە مەبەستی ئاشتکردنەوە} ،

جا اللَّهُ هەندێ لەو هەڵسوکەوتانەمان کە دەبێ بەهۆی بێهێزبونی برایەتی لە نێوان کومەڵگای ئیسلامیدا دەخاتە پێش چاو تا خۆمانی لێدور بگرین و دەفەرموێ:

(١١) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە با تاقمێك لەپیاونتان گاڵتە بە تاقمێکی ترتان نەکات، چونکە لەوانەیە ئەو گاڵتە پێکراوانە چاکتر بن لەو گاڵتەکەرانە، وە هیچ ئافرەتێکیش گاڵتە نەکات بە ئافرەتێکی تر نزیکە کە ئەو گاڵتە پێکراوانە چاکتر بن لەو گاڵتەکەرانە.وەبەهیمای چاوو برۆ تانەوتەشەر لەیەك نەدەن و ناوو ناتۆرە بۆ یەکتر دانەنێن، پاش باوەڕهێنان ناوی فاسقی خراپترین ناوە کە دابنرێت بۆ باوەڕدار، یان بەهۆی ئەم ئیشە خراپانەوە باوەڕدار خۆی بکات بە فاسق. ئەوسا هەر کەسێك لەم ئیشە خراپانە پەشیمان نەبێتەوە ئەوە ستەمکارەو خوایش ستەمکارانی خۆش ناوێت.

لە فەرمودەدا هاتوە کە ئەبو جەبیرەی کوڕی زەحاك وتویەتی: {فِينَا نَزَلَتْ فِي بَنِي سَلِمَةَ وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ قَالَ قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ الْمَدِينَةَ وَلَيْسَ مِنَّا رَجُلٌ إِلَّا وَلَهُ اسْمَانِ أَوْ ثَلَاثَةٌ فَكَانَ إِذَا دُعِيَ أَحَدٌ مِنْهُمْ بِاسْمٍ مِنْ تِلْكَ الْأَسْمَاءِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ يَغْضَبُ مِنْ هَذَا قَالَ فَنَزَلَتْ ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَـٰبِ﴾ الحجرات: ١١ /ابوداودوغيره. صححه الالباني/

سەبارەت بەئێمە لە بەنی سەلیمەئایەتی ﴿وَلَا تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ﴾ دابەزی وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە هیچ کەس نەبو لەئێمە کەدوو ناو یان سێ ناوی نەبێت، جا هەرکاتێ یەکێك لەوان بەیەکێك لەو ناوانە بانگ بکرایە دەیان وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەراستی ئەو رقیەتی لەوناوە، وتی: ئەوسا ئایەتی﴿وە ناوو ناتۆرە بۆ یەکتر دانەنێن﴾دابەزی}

(١٢)ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لە زۆرێك لە گومانەکان خۆتان بپارێزن ، بێگومان هەندێك لە گومان تاوانە چونکە هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، سیخوڕیو جاسوسی مەکەنو هەندێکتان لە پاش ملە باسی هەندێکتان بەخراپی مەکەن ، ئایا هیچ کەس لە ئێوە پێی خۆشە گۆشتی برای خۆی بە مردوویی بخوات؟ ئاشکرایە کە قێزتان لێی دەبێتەوە، جا لە اللهُ بترسن بێگومان کەاللهُ پەشیمانی وەردەگرێتو میهرەبانە سەبارەت بە بەندەکانی. لەم بارەوە فەرمودە زۆرە لەوانە ئەم فەرمودەیە کە دەفەرموێ:{لا تَقَاطَعُوا، وَلا تَدَابَرُوا، وَلا تَبَاغَضُوا، وَلا تَحَاسَدُوا، وَكُونُوا عِبَادَ اللهِ إخوَاناً، ولا يَحِلُّ لِلمُسلِمِ أن يَهجُرَ أخَاهُ فَوقَ ثَلاثَةِ أيَّامٍ/ ابوداود.صححه الالباني/پەیوەندی خزمایەتی نەبچڕن، پشت لە یەکتر نەکەن ، ڕقتان لە یەکتر نەبێت، ئیرەیی بە یەکتر مەبەن، بەندەی خودا بنو برای یەکتر بن. وە بۆ هیچ موسڵمانێك دروست نیە زیاتر لە سێ ڕۆژ دەنگ لە برای خۆی وەربگرێتو قسەی لەگەڵدا نەکات}وئەم فەرمودەیەش کە دەفەرموێ:{ أَتَدْرُونَ مَا الْغِيبَةُ قَالُوا اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ قَالَ ذِكْرُكَ أَخَاكَ بِمَا يَكْرَهُ قِيلَ أَفَرَأَيْتَ إِنْ كَانَ فِي أَخِي مَا أَقُولُ قَالَ إِنْ كَانَ فِيهِ مَا تَقُولُ فَقَدْ اغْتَبْتَهُ وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِيهِ فَقَدْ بَهَتَّهُ /مسلم/ ئایا دەزانن غەیبەت چییە؟ وتیان خواو پێغەمبەرەکەیﷺ زاناترن، فەرموی: باسی براکەتە لەپاش ملە بەوەی کە پێی ناخۆشە، بێژرا: ئەی پێت چۆنە ئەگەر لەبراکەمدا بێ ئەوەی کە دەیڵێم؟ فەرموی: ئەگەر تێیدا بێت غەیبەتە ئەگینا بختیانت کردووەودرۆت بۆ هەڵبەستوە}.

(١٣)ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروستکردووەو کردومانن بە چەندین گەلو هۆزەوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسنو چاکە لەگەل یەکتردا بکەن بێگومان بەڕێزتان لە لای خوا پارێزکارانتانە بێشك کە خوا زۆر زاناو بەئاگایە. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:{ إنَّ اللهَ لا يَنظُرُ إلَى صُوَرِكُم وَ أمـوَالِكُم وَلَكِـن يَنظُرُ إلَى قُلُـوبِكُم وَأعمَـالِكُم؛/ السلسلة الصحيحة / بێگومان کە خوا سەیری دیمەنو سامانی ئێوە ناکات بەڵام تەماشای دڵتانو کردارەکانتان دەکات}هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەکەدا خوتبەی بۆخەڵك خوێندەوەوفەرموی: { يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ قَدْ أَذْهَبَ عَنْكُمْ عُبِّيَّةَ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ﴿١٣﴾ ۞قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿١٥﴾ قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١٦﴾ يَمُنُّونَ عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾

الْجَاهِلِيَّةِ وَتَعَاظُمَهَا بِآبَائِهَا فَالنَّاسُ رَجُلَانِ بَرٌّ تَقِيٌّ كَرِيمٌ عَلَى اللَّهِ وَفَاجِرٌ شَقِيٌّ هَيِّنٌ عَلَى اللَّهِ وَالنَّاسُ بَنُو آدَمَ وَخَلَقَ اللَّهُ آدَمَ مِنْ تُرَابٍ قَالَ اللَّهُ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ ...الآيـة﴾ /الترمذي.حسنه الالباني/ ئەی خەڵکینە بێگومان اللهُ لوت بەرزیو نەفامیو خۆهەڵکێشان بەباوباپیرانی لەناو ئێوەدا لابردوە، چونکە خەڵك دوو جۆرە، چاکی پارێزکاری بەرێز لەلای خوا، وە تاوانباری خراپی سوك لەلای خوا، خەڵك هەموی کوڕی ئادەمن، وە خوا ئادەمی لە خاك دروستکردوە،خوا دەفەرموێ:﴿ ئەی خەڵکینە بێگومان ئێمە ئێوەمان لە نێرو مێیەك دروستکردووەو کردومانن بە چەندین گەلو هۆزەوە بۆ ئەوەی یەکتر بناسنو چاکە لەگەل یەکتردا بکەن بێگومان بەڕێزتان لە لای خوا پارێزکارترتانە بێگومان کە خوا زۆر زاناو بەئاگایە﴾}.

(١٤)عەرەبە دەشتەکییەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺو وتیان: باوەڕمان هێناوە، خوا دەفەرموێ: بڵێ، باوەڕتان نەهێناوە بەڵکو ڕاست وایە بڵێن: خۆمان بەدەستەوە داوە چونکە هێشتا باوەڕی ئیسلامەتی نەچۆتە ناو دڵتانەوە. جا ئەگەر پەیرەوی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن اللهُ هیچ شتێك لە کارو کۆششە چاکە کانتان کەم ناکاتەوە، بێگومان کە خوا چاوپۆشیکەرە لە تاوانی بەندەکانیو بێنیهایەت میهرەبانە.

(١٥)باوەڕداران هەر ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ هێناوە، پاشان نەکەوتوونەتە گومانەوە لە

٥٠ — سُورَةُ قٓ — ٤٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قٓۚ وَٱلۡقُرۡءَانِ ٱلۡمَجِيدِ ﴿١﴾ بَلۡ عَجِبُوٓاْ أَن جَآءَهُم مُّنذِرٞ مِّنۡهُمۡ فَقَالَ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا شَيۡءٌ عَجِيبٌ ﴿٢﴾ أَءِذَا مِتۡنَا وَكُنَّا تُرَابٗاۖ ذَٰلِكَ رَجۡعُۢ بَعِيدٞ ﴿٣﴾ قَدۡ عَلِمۡنَا مَا تَنقُصُ ٱلۡأَرۡضُ مِنۡهُمۡۖ وَعِندَنَا كِتَٰبٌ حَفِيظُۢ ﴿٤﴾ بَلۡ كَذَّبُواْ بِٱلۡحَقِّ لَمَّا جَآءَهُمۡ فَهُمۡ فِيٓ أَمۡرٖ مَّرِيجٍ ﴿٥﴾ أَفَلَمۡ يَنظُرُوٓاْ إِلَى ٱلسَّمَآءِ فَوۡقَهُمۡ كَيۡفَ بَنَيۡنَٰهَا وَزَيَّنَّٰهَا وَمَا لَهَا مِن فُرُوجٖ ﴿٦﴾ وَٱلۡأَرۡضَ مَدَدۡنَٰهَا وَأَلۡقَيۡنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا مِن كُلِّ زَوۡجِۭ بَهِيجٖ ﴿٧﴾ تَبۡصِرَةٗ وَذِكۡرَىٰ لِكُلِّ عَبۡدٖ مُّنِيبٖ ﴿٨﴾ وَنَزَّلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ مُّبَٰرَكٗا فَأَنۢبَتۡنَا بِهِۦ جَنَّٰتٖ وَحَبَّ ٱلۡحَصِيدِ ﴿٩﴾ وَٱلنَّخۡلَ بَاسِقَٰتٖ لَّهَا طَلۡعٞ نَّضِيدٞ ﴿١٠﴾ رِّزۡقٗا لِّلۡعِبَادِۖ وَأَحۡيَيۡنَا بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗاۚ كَذَٰلِكَ ٱلۡخُرُوجُ ﴿١١﴾ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ وَأَصۡحَٰبُ ٱلرَّسِّ وَثَمُودُ ﴿١٢﴾ وَعَادٞ وَفِرۡعَوۡنُ وَإِخۡوَٰنُ لُوطٖ ﴿١٣﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡأَيۡكَةِ وَقَوۡمُ تُبَّعٖۚ كُلّٞ كَذَّبَ ٱلرُّسُلَ فَحَقَّ وَعِيدِ ﴿١٤﴾ أَفَعَيِينَا بِٱلۡخَلۡقِ ٱلۡأَوَّلِۚ بَلۡ هُمۡ فِي لَبۡسٖ مِّنۡ خَلۡقٖ جَدِيدٖ ﴿١٥﴾

خواو پێغەمبەرﷺو ئایینەوە، جا بە ماڵیان‌و بە گیانیان لە ڕێگای بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلامدا غەزایان کردوە، هەر ئەمانە ڕاستگۆیانن لە بیروباوەڕو هەڵسوکەوتیاندا.

﴿١٦﴾ بڵێ: ئایا دەتانەوێت بە ئەم قسەیە خوا لەو ئایینەی کە هەتانە ئاگادار بکەنەوە لە حاڵێکدا کە خوا بەوەی کە لەناو ئاسمانان‌و لەناو زەویدا هەیە دەزانێت؟ وە خوا زانایە بە هەمو شتێك کە ئێوە دەیڵێن‌و دەیکەن.

﴿١٧﴾ ئەوان منەت بەسەر تۆدا دەکەن کە موسڵمان بوون ، بڵێ: منەت مەخەنە سەر من بە موسڵمان بوونتان بەڵکو ئەگەر ڕاستگۆبن‌و ڕاستبن لەبیروباوەڕەکانتاندا هەر خوایە منەت دەخاتە سەر ئێوە کە ڕێگای باوەڕهێنانی پیشانداون.

﴿١٨﴾ بێگومان الله نهێنی ئاسمانان‌و زەوی دەزانێت، وەالله بینەری ئەو کارانەیە کە ئێوە دەیکەن.

## ٥٠ — سورەتی قاف — ٤٥

سورەتی قاف کە بە سورەتی (الباسقات)یش ناوبراوە، پەنجاهەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتووتە خوارەوە جگە لە ئایەتی ﴿ وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ وَمَا بَيۡنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٖ ﴿٣٨﴾ ﴾ ، وەچل‌و پێنج ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سی‌وچوارهەمەو پاش سورەتی (المرسلات) و پێش (البلد) دابەزیوە. پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جەژندا (قاف)و (اقتربت)ی دەخوێندەوەو هەروەها بەردەوام لە وتاری جومعەدا سورەتی قافی دەخوێندەوە.

بەناویالله ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ قاف، هەرالله مەبەستی ئەم پیتانە دەزانێت، سوێند بەم قورئانە بەشکۆو بەڕێزە

﴿٢﴾ نەك هەر باوەڕیان بەم قورئانە نەکرد بەڵکو لەوەی کە ترسێنەرێك لە خۆیان هاتووەتە لایان سەریان سوڕمابو، جا خوانەناسان وتیان: ئەمە شتێکی سەرسوڕهێنەرە.

﴿٣﴾ئایا کاتێك کە مردین‌و بووین بە خاك سەرلەنوێ زیندو دەکرێینەوە، ئەمە گەڕاندنەوەیەکی دوورلە ڕاستی‌ولە عەقڵەو ناگونجێت؟! جا پەروەردگاریش دەفەرموێ: بۆچی پێتان دوورە ئەو گەڕانەوە، وا دەزانن کە وردو هەپرون هەپرون بون نازانین چەندێکن‌و چیتان لێهاتووە ئەو ڕێزاڵانە لەکوێن؟

﴿٤﴾بەراستی ئێمە زانیومانە کە زەوی چەندێك لەوان کەمدەکاتەوەو چۆن پاش مردنیش لاشەیان دەڕزێنێت، خۆ پەڕاوی چاودێریکەرمان لە هەمو ئەندامەکانی ئەوانمان لەلایەو هەموی تێدا تۆمارکراوە چەندەو لەکوێیەو هیچی لای ئێمە شاراوەو بزر نیە.

﴿٥﴾ بەڵکو ئەوان لەکاتێکدا کە ئەم پەڕاوە ڕاستەیان هاتە لا باوەڕیان پێ نەکرد، جا ئەوان لە بارودۆخێکی ئاڵۆزدا بون، هەردەمەو بە شتێك ناویان دەبرد، جارێك جادووگەرو جادوو، جارێکی تر شاعیرو شیعرو هەندێ جاری تریش فاڵچی‌و فالگرتنەوە، ئەوسا پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿٦﴾ئایا ئەوانە بۆ ئەو ئاسمانەی کە لە سەریانەوەیە ناڕوانن‌و لێی ورد نەبونەتەوە کە چۆنمان دروستکردووەو چۆنمان ڕازاندوەتەوە لەحاڵێکدا کە هیچ کون‌و کەلێنێکی تێدا نیە؟ بۆ ئەوەی کە پەندو ئامۆژگاری لێ وەربگرن.

﴿٧﴾جا ئایا تەماشای زەوی ناکەن کە چۆنمان ڕاخستووەو چیای بتەومان کوتاوە بە ناویدا کە ڕای بگرێت‌و لە هەمو دارو درەخت‌و گوڵ‌و گیایەکی جووت‌و جوانمان تێدا سەوزکردوە؟

﴿٨﴾ تا چاوی دڵ ڕۆشن بکاتەوەو ببێت بە ئامۆژگاریکەرو پەند لێوەرگرتن بۆ هەمو بەندەیەك کە بیەوێت بۆ لای پەروەردگاری بگەڕێتەوە.

(٩) ئەوسا لە ئاسمانەوە ئاوێکی بە پیتمان نارده خوارەوە، جا بەو ئاوە باغاتێكی زۆرمان تێدا ڕواندو ئەو دانەوێڵەش كە درەو دەكرێت.

(١٠) جا دارخورمای بەرز یش بە هێشوی لەسەریەك كۆكراوە.

(١١) ئەمانە هەموویان ڕۆزیەكی فرەوانن بۆ بەندەكانو بەو ئاوەش چەندین وڵاتی وشكو بێ ئاومان بە ئاوو گژوگیا زیندوكردەوە (ئەمانە چۆن دەبینن بە چاوی خۆتان بەدڵنیاییەوە) هەر ئاوەهاش دەرچوون لە گۆڕەكانو زیندوبونەوەی بەندەكان بۆ حیساب ڕوودەدات.

(١٢) لەپێش ئەواندا گەلی نوحو یارەكانی بیرەكەو سەمود باوەڕیان نەكرد بە پێغەمبەرەكەیان.

(١٣) جا عادو فیرعەونو برایانی لوتیش.

(١٤) جاگەلی شوعەیبو گەلی توببەعیش ئەمانە هەر هەموویان باوەڕیان نەكرد بە پێغەمبەرەكان، جا ئیتر هەڕەشەی ئێمەش سەری گرت بۆیان. ئەوسا هەریەكەیان وەكو لە شوێنانی تری قورئاندا باسكراوە بە جۆرێك سزادران لە دنیاداو سزای پاشەڕۆژیش هەر خوا خۆی لە چەندو چۆنی دەزانێت. جا ئەوەی كە پێغەمبەرێك بەدرۆ بخاتەوەو باوەڕی پێ نەكات وەك ئەوە وایە كە هەمو پێغەمبەرێكی بە درۆخستبێتەوە، وەك چۆن الله لەبارەی گەلی نوح دەفەرموێ: ﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ نُوحٍ ٱلْمُرْسَلِينَ /الشعراء: ١٠٥/ واتە گەلی نوح هەمو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستەوە ﴾ ئەمە لەحاڵێكدایە كە ئەوان تەنها یەك پێغەمبەریان بۆهاتوە كە نوح بو.

(١٥) ئایا ئێمە لە دروستكردنی سەرەتا كە یەكەم جار ئەوانمان دروستكردماندوو ببوینو گرفتمان هاتەڕێ؟ نەخێر نەك ماندو نەبوین، بەڵكو ئێوە بەچاوی خۆتان دەبینن كە بەردەوام ئەو هەمو بونەوەرو نیعمەتانە دروست دەكەین، بەڵێ ئەوان لەمەدا گومانیان نیە بەڵكو ئەوان لە دروستكردنی تازەو دووبارە لە گوماندا، دەی ئایا ئەمە جگە لە گێلی شتێكی ترە؟! چونكە دووبارە دروستكردن زۆر ئاسانترە لەدروستكردنی لەسەرەتادا، لە فەرمودەیەكی قودسیدا پەروەردگار دەفەرموێ: {كَذَّبَنِي ابْنُ آدَمَ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ وَشَتَمَنِي وَلَمْ يَكُنْ لَهُ ذَلِكَ فَأَمَّا تَكْذِيبُهُ إِيَّايَ فَقَوْلُهُ لَنْ يُعِيدَنِي كَمَا بَدَأَنِي وَلَيْسَ أَوَّلُ الْخَلْقِ بِأَهْوَنَ عَلَيَّ مِنْ إِعَادَتِهِ /البخاري/ ئادەمیزاد من بەدرۆم دەخاتەوە كە ئەوە بۆ ئەو ڕەوانیە وە جنێوم پێدەدات لەحاڵێكدا ئەوە بۆ ئەو نیە، جا ئەوەی كە من بەدرۆ دەخاتەوە ئەوەیە كە دەڵێت: هەرگیز نامگەڕێنێتەوە وەك

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِۦ نَفْسُهُۥ ۖ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ ٱلْوَرِيدِ (١٦) إِذْ يَتَلَقَّى ٱلْمُتَلَقِّيَانِ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ (١٧) مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ (١٨) وَجَآءَتْ سَكْرَةُ ٱلْمَوْتِ بِٱلْحَقِّ ۖ ذَٰلِكَ مَا كُنتَ مِنْهُ تَحِيدُ (١٩) وَنُفِخَ فِى ٱلصُّورِ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْوَعِيدِ (٢٠) وَجَآءَتْ كُلُّ نَفْسٍ مَّعَهَا سَآئِقٌ وَشَهِيدٌ (٢١) لَّقَدْ كُنتَ فِى غَفْلَةٍ مِّنْ هَٰذَا فَكَشَفْنَا عَنكَ غِطَآءَكَ فَبَصَرُكَ ٱلْيَوْمَ حَدِيدٌ (٢٢) وَقَالَ قَرِينُهُۥ هَٰذَا مَا لَدَىَّ عَتِيدٌ (٢٣) أَلْقِيَا فِى جَهَنَّمَ كُلَّ كَفَّارٍ عَنِيدٍ (٢٤) مَّنَّاعٍ لِّلْخَيْرِ مُعْتَدٍ مُّرِيبٍ (٢٥) ٱلَّذِى جَعَلَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَأَلْقِيَاهُ فِى ٱلْعَذَابِ ٱلشَّدِيدِ (٢٦) ۞ قَالَ قَرِينُهُۥ رَبَّنَا مَآ أَطْغَيْتُهُۥ وَلَٰكِن كَانَ فِى ضَلَٰلٍ بَعِيدٍ (٢٧) قَالَ لَا تَخْتَصِمُوا۟ لَدَىَّ وَقَدْ قَدَّمْتُ إِلَيْكُم بِٱلْوَعِيدِ (٢٨) مَا يُبَدَّلُ ٱلْقَوْلُ لَدَىَّ وَمَآ أَنَا۠ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ (٢٩) يَوْمَ نَقُولُ لِجَهَنَّمَ هَلِ ٱمْتَلَأْتِ وَتَقُولُ هَلْ مِن مَّزِيدٍ (٣٠) وَأُزْلِفَتِ ٱلْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ (٣١) هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِّ أَوَّابٍ حَفِيظٍ (٣٢) مَّنْ خَشِىَ ٱلرَّحْمَٰنَ بِٱلْغَيْبِ وَجَآءَ بِقَلْبٍ مُّنِيبٍ (٣٣) ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُلُودِ (٣٤) لَهُم مَّا يَشَآءُونَ فِيهَا وَلَدَيْنَا مَزِيدٌ (٣٥)

لەسەرەتادا دروستیكردوم لەحاڵێكدا دروستكردنی یەكەم جارم لا ئاسانترە لە هێنانەوەی سەرلەنوێ}

(١٦) جا بەڕاستی ئێمە مرۆڤمان دروستكردووەو دەزانین بەو خەیاڵانەشی كە بە دڵو دەرونی دا دێت، ئێمە لە شادەماری دڵی نزیكترین لەو، ئەگەر مرۆڤ بە مردن لەشی هیچی بەسەر هیچەوە نامێنێت، بەڵام پاش ئەویش هەمو ڕیزاڵەكانی لەژێر چاودێری الله دایەو فریشتەی چاودێریكەری لەسەر داناوەو لەكاتی زیندوكردنەوەیدا بە چاو تروكانێك دەیهێنینەوەو زیندو دەبێتەوە، جا شادەماری دڵ لەكوێو زانیاریو سەربازانی خوا لەسەر ئەو بەندە لەكوێ؟!

(١٧) ئەو كاتەی كە دوو فریشتەكان گەیشتنە یەك لەسەر شانی ڕاستو چەپی دانیشتن بۆ تۆماركردنی كردارو گوفتارەكانی،

(١٨) جا هیچ قسەیەك بە دەمیدا نایەت مەگەر فریشتەی چاودێرو ئامادە لەلای بنو تۆماری بكەن.

(١٩) جا بێهۆشی وئازارەكانی سەرەمەرگ هێنای ئەو حەقیقەتو ڕاستیە كە مردنە، جا لەو كاتەی سەرەمەرگدا پێی دەوترێت: ئەوە ئەو شتەیە كە تۆ ناتوانیت خۆتی لێ دووربخەیتەوە یان ئەوەیە كە ڕات دەكرد كەپێت نەگات، كەواتە مردن حەقیقەتێكە كە ئێمە ئەگەرچی لێی ڕادەكەین، بەڵام لەكاتی دیاری كراوی خۆیدا پێمان دەگات، پرسیار كرا لە پێغەمبەری خواﷺ كە كام

باوەڕدار لە هەمو كەس ژیرو عاقڵترە؟ فەرمویی: {أَكْثَرُهُمْ لِلْمَوْتِ ذِكْرًا وَأَحْسَنُهُمْ لِمَا بَعْدَهُ اسْتِعْدَادًا أُولَئِكَ الْأَكْيَاسُ/ابن ماجه، حسنه الألباني/ ئەوەیان كە زۆرتر یادی مردن دەكاتەوەو باشتر لە هەمویان خۆی بۆ دوای مردن ئامادە دەكات ئائەوانەن عاقڵترین}

(٢٠) جا فووكرا بە كەلەشاخدا كە ئەوە ڕۆژی ئەو هەڕەشەیە كە چەندین جار دوویات بووەتەوە، كە قیامەتو باقی بەسەرهاتەكانی تری تێدا دێتەجێ كە پەروەردگار بەڵێنی پێداوە كە دەیهێنێتو تۆڵە لە بێباوەڕان دەسێنێت، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {كَيْفَ أَنْعَمُ وَصَاحِبُ الْقَرْنِ قَدْ الْتَقَمَ الْقَرْنَ وَاسْتَمَعَ الْإِذْنَ مَتَى يُؤْمَرُ بِالنَّفْخِ فَيَنْفُخُ فَكَأَنَّ ذَلِكَ ثَقُلَ عَلَى أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ لَهُمْ قُولُوا حَسْبُنَا اللَّهُ وَنِعْمَ الْوَكِيلُ عَلَى اللَّهِ تَوَكَّلْنَا /الترمذي، صححه الألباني/ چۆن لەزەت لە ژیان بەرم لەحاڵێكدا ئەو فریشتەیە كە كەلەشاخی بەدەستە دەمی پێوەناوەو گوێی ڕاگرتوە بۆ ئەوەی كە ئیجازەی پێبدرێت، جا كەی فەرمانی پێكرا كە فوی كات ئەوسا فوی دەكات، جا وادەركەوت كە ئەم فەرمایشەی پێغەمبەرﷺ لەسەر یارانی قورس بو، جا بۆیە پێی فەرمون: بڵێن، بەسە بۆ ئێمە ﷲ كە باشترین پارێزەرە، وەهەر پشت بەﷲ یش دەبەستین}

(٢١) ئەوسا هەر كەسێكیش كە دێت پاڵ نەرێك پاڵی دەنێتو شایەتێكی لەگەڵدایە.

(٢٢) جا پێی دەڵێن: بە حەقیقەت تۆ لەمە بێ ئاگابویت، ئەوسا ئێمە ئەو پەردەی كە بەسەر چاوتەوەیە لای دەبەین ئینجا چاوی تۆ هەروەكو ئاسن بۆ هەر لایەكی بگێڕیت دەیبینیتو هیچ شتێك نابێت بە بەرپەرچ لە ڕێگایدا.

(٢٣) جا فریشتەی هاوڕێو چاودێری وتی: ئەمە هەم خۆیو هەم كردارە تۆماركراوەكانی كە لەلای من ئامادەیە.

(٢٤) ئینجا بە مالیكی بەرپرسی ئاگر دەوترێت: دەی فڕێیدەن، فڕێیدەنە ناو دۆزەخ هەمو سپڵەو خوانەناسێكی سەركەش.

(٢٥) بەرگریكەر لە چاكەو دەستدرێژیكەر لە سەر ماڧی پەروەردگارو پێشێلكەری ماڧی خەڵكە، ئەوەی كە خۆی بە گومانە لە پاشەڕۆژ و خەڵكیشی دەخستە گومانەوە.

(٢٦) ئەو كەسەی كە لەگەڵﷲ دا شتانێكی تری پەرستوە، ئەوسا دەی فڕێی بدەن، فڕێی بدەن بۆ ناو سزایەكی توند. پێغەمبەری خواﷺ دە فەرموێ:{ يَخْرُجُ عُنُقٌ مِنْ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ لَهُ عَيْنَانِ يُبْصِرُ بِهِمَا وَأُذُنَانِ يَسْمَعُ بِهِمَا وَلِسَانٌ يَنْطِقُ بِهِ فَيَقُولُ إِنِّي وُكِّلْتُ بِثَلَاثَةٍ بِكُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ وَبِكُلِّ مَنْ ادَّعَى مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَالْمُصَوِّرِينَ/أحمد، صححه الألباني/ پێغەمبەری خواﷺ فەرموی: لەڕۆژی قیامەتدا گەردنێك لەئاگر بەرز دەبێتەوە كەدووچاوی هەیە پێیان دەبینێو دووگوێی هەیە پێیان دەبیسێو زمانێكی هەیە قسەی پێدەكات جا دەڵێ من سزای سێ كەسم دراوەتە دەست، هەمو ملهوڕێكی سەر كەشو هەمو كەسێ كەبڵێ لەگەڵ خوادا پەرستراوێكی تر هەیەو هەمو وێنەگران} . ئەم ڕوداوانە هەمویان بەشێوەی ڕابردو هاتوون، بەڵام هێشتا ڕویان نەداوە مەبەست ئەوەیە: كە هەواڵەكانی قورئان بۆ ئاییندە ئەوەندە ڕاستە هەروەكو ئەوە وایە كە رووی دابێت ئێمەش هەتا ئێرە بە شێوەی ڕابردوو مانامان كردن. چاك وردببنەوەو بزانن هەموو هەواڵەكانی ناو قورئانو فەرمودەكانی پێغەمبەرمان ﷺ هەروەكو ڕابرو چۆن هیچگومانی تێدا نەماوە ئاوەها هیچ گومانێك لە ڕوودانی ئەوانیشدا نیە. جا خوانەناسان دەڵێن: ئێمە هاوڕێكەمان سەری لێتێكداین كە شەیتانەو ڕێگای ڕاستی لێ ون كردین.

(٢٧) هاوڕێكەیشیان دەڵێت: ئەی پەروەردگاری هەمومان من سەرم لەو نەشێواندوە بەڵام ئەو خۆی لەوپەڕی گومڕییدا بووە، جا پەروەردگاریش دەمكوتی دەكات،

(٢٨) دەفەرموێ: هیچ دەمەقەڵەیەك لەلای من سوودی نیەو بە ڕاستی لە دنیادا هەڕەشەی ئەم سزایەم پێگەیاندنو پێم وتن: ئەگەر باوەڕ نەهێنن ڕووبەڕووی ڕۆژگارێكی ئاوا سەختو دژوار دەبن،

(٢٩) تازە ئەو قسەم ناگۆڕمو من هیچ ستەمێك لە هیچ بەندەیەكم ناكەم. وشەی (ظَلاَّم) بە واتای (الظالم) واتە ستەمكار دێت بۆ مبالغە نیە وردبەرەوەوەك (تمَّار، نجَّار/خورمافرۆش، دارتاش)وایە.

(٣٠) ئەو ڕۆژە بە دۆزەخ دەڵێین: ئایا پڕ بوویت؟ دەڵێت: ئایا زیاتریش هەیە؟ واتە: هەمو دۆزەخیان دەخرێنە ناو دۆزەخەوە هێشتا دۆزەخ پڕ نابێت، لە فەرموودەدا كە ئیمامی أحمدو ئیمامی مسلم هێناویانە هاتوە لە ئەنەسەوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:{لاتَزَالُ جَهَنَّمُ يُلقَى فِيهَا وَتَقُولُ: هَل مِن مَزِيد؟ حَتَّى يَضَعُ رَبُّ العِزَّةِ فِيهَا قَدَمَهُ فَيَنزَوِى بَعضُها إلى بَعضٍ وَتقولُ: قَط، قَط، وَعِزَّتِكَ وَكَرَمِكَ. وَلا يَزَالُ فِي الجَنَّةِ فَضلٌ حَتَّى يُنشىءَ اللهُ لَهَا خَلقاً اخَرَ فَيُسكِنُهُم فِي فُضولِ الجَنَّةِ/متفق عليه/ دۆزەخ هەر لەبەرەوە خراپەكارانی تێدەخرێتو ئەو هەر دەڵێت هەر ماوە؟ تا خراپەكار نامێنێتو دۆزەخ هێشتا پڕ نەبوە ئینجا پەروەردگاری دەسەڵاتدار پێی خۆی بەو شێوەیەی كە شایستەی ئەو زاتەیە دەخاتە ناویەوە، ئەوسا هەندێكی دەخاتە ناو هەندێكیەوەو دۆزەخ هاواری لێ بەرزدەبێتەوەو دەڵێت: بەسە، بەسە، بەڵام

بەهەشت پاش ئەوەی کە هەمو بەهەشتیان چونە ناو بەهەشتەوە جێگای خاڵی دەمێنێت تا خوا دروستکراوێکی تر دروست دەکات، ئینجا لەو شوێنە خاڵیەی بەهەشتدا دایان دەنێت.

(٣١) ئەوسا بەهەشتیش لە پارێزکارانەوە نزیك خراوەتەوەو دوور نیە، پێیان دەوترێت:

(٣٢) ئەمە ئەو بەڵێنە چاکە بو کە بەڵێنمان دابو بە هەمو بەندەیەکی ڕوو لەخواو خۆپارێز لە خراپەو تاوانو خۆ پارێز لە سەرپێچی لە فەرمانی خودا، ئەوانە کێن؟

(٣٣) ئەو کەسەی کە لە پەنامەکیدا لە ڕەحمان دەترسێتو بە دڵێکی پاکەوە هاتووەتە لامان.

(٣٤) پێیان دەوترێت بێترسو هێمنانە بە سڵاوو ڕێزی پەروەردگارو فریشتەکان بچنە ناو بەهەشتەوە، ئەوە ڕۆژی نەمریو نەبڕاوەیی نیعمەتەکانەو بۆ هەمیشە سەقامیگر بون لە ناو بەهەشتدایە.

(٣٥) ئەوەی کە ئارەزۆوی بکەن لەناویدا هەر بۆ ئەوانەو شتی زیاتریشمان لایە. لەوانە دەعوەتی پەروەردگارە بۆ بینینی خۆی کە لە هەمو خۆشیەکانی بەهەشت خۆشترە کە لە هەمو شەوێکی جومعەدا لەو ماڵە بەرزو بەڕێزەدا بەدیداری شاد دەبن پێغەمبەرمان فەرمویەتی: {إِذَا دَخَلَ أَهْلُ الْجَنَّةِ الْجَنَّةَ قَالَ يَقُولُ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى تُرِيدُونَ شَيْئًا أَزِيدُكُمْ فَيَقُولُونَ أَلَمْ تُبَيِّضْ وُجُوهَنَا أَلَمْ تُدْخِلْنَا الْجَنَّةَ وَتُنَجِّنَا مِنْ النَّارِ قَالَ فَيَكْشِفُ الْحِجَابَ فَمَا أُعْطُوا شَيْئًا أَحَبَّ إِلَيْهِمْ مِنْ النَّظَرِ إِلَى رَبِّهِمْ عَزَّ وَجَلَّ/مسلم وغيره/ کاتێك بەهەشتیەکان دەچنە ناو بەهەشتەوە وتی: پەروەردگار دەفەرموێ: ئایا شتێکتان دەوێت بۆتان زیاد بکەم، جا دەڵێن: ئایا دەمو چاوت سپیو ڕۆشن نەکردین ئایا ئێمەت نەخستە ناو بەهەشتەوەو لە ئاگر ڕزگارت نەکردین، وتی: جا پەروەردگار حیجاب لادەبات ئەوسا هیچ شتێکی خۆشتر لە تەماشاکردنی پەروەردگاریان بەشکۆوگەورە پێنەدراوە}

(٣٦) زۆر خەڵکو وڵاتمان لە پێش ئەواندا کە لەوان بەهێزترو لێدەرتر بون لەناوبردوە، جا بڕۆن بە وڵاتاندا بگەڕێنو بزانن هیچ پەناگەو دەرەتانێکیان بۆ پەیدابوە. ئیتر ئێوە بۆ بیرناکەنەوە؟

(٣٧) بێگومان لەم باسەدا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ ئەو کەسەی کە دڵێکی وریای هەبێت یان بەباشی گوێی لێ بێتو دڵی لەلای بێت. جولەکە دەیان وت: خودا ئاسمانانو زەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکردوە پاشان لە ڕۆژی حەوتەمدا کە ڕۆژی شەممەیە

وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَشَدُّ مِنْهُم بَطْشًا فَنَقَّبُوا۟ فِى ٱلْبِلَـٰدِ هَلْ مِن مَّحِيصٍ ﴿٣٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَذِكْرَىٰ لِمَن كَانَ لَهُۥ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى ٱلسَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ فَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ قَبْلَ طُلُوعِ ٱلشَّمْسِ وَقَبْلَ ٱلْغُرُوبِ ﴿٣٩﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَسَبِّحْهُ وَأَدْبَـٰرَ ٱلسُّجُودِ ﴿٤٠﴾ وَٱسْتَمِعْ يَوْمَ يُنَادِ ٱلْمُنَادِ مِن مَّكَانٍ قَرِيبٍ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يَسْمَعُونَ ٱلصَّيْحَةَ بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكَ يَوْمُ ٱلْخُرُوجِ ﴿٤٢﴾ إِنَّا نَحْنُ نُحْىِۦ وَنُمِيتُ وَإِلَيْنَا ٱلْمَصِيرُ ﴿٤٣﴾ يَوْمَ تَشَقَّقُ ٱلْأَرْضُ عَنْهُمْ سِرَاعًا ۚ ذَٰلِكَ حَشْرٌ عَلَيْنَا يَسِيرٌ ﴿٤٤﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْهِم بِجَبَّارٍ ۖ فَذَكِّرْ بِٱلْقُرْءَانِ مَن يَخَافُ وَعِيدِ ﴿٤٥﴾

## سُورَةُ الذَّارِيَاتِ ٥١ — ٦٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلذَّٰرِيَـٰتِ ذَرْوًا ﴿١﴾ فَٱلْحَـٰمِلَـٰتِ وِقْرًا ﴿٢﴾ فَٱلْجَـٰرِيَـٰتِ يُسْرًا ﴿٣﴾ فَٱلْمُقَسِّمَـٰتِ أَمْرًا ﴿٤﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَصَادِقٌ ﴿٥﴾ وَإِنَّ ٱلدِّينَ لَوَٰقِعٌ ﴿٦﴾

حەساوەتەوە، جا پەروەردگار بۆ بەدرۆ خستنەوەیان ئەم ئایەتەی ناردو دەفەرموێ:

(٣٨) بە ڕاستی ئێمە ئاسمانانو زەویو ئەوەی کە لەنێوانیاندایە لە شەش ڕۆژدا دروستمان کردوونو هیچ ماندویش نەبوین تا پێویستمان بە حەسانەوەو پشوودان بێت.

(٣٩) جا تۆ خۆت بگرە لەسەر ئەو قسە ناشیرینانەی کە دەیڵێنو پاكو بێ عەیبی پەروەردگاری خۆت بڵێ لەگەڵ سوپاسکردنیدا پێش خۆرهەڵهاتنو پاش ئاوابون.

(٤٠) جا بەشێکیش لە شەو دیسان پاکیو بێ عەیبی ئەو بڵێو پاش نوێژەکانیش هەر یادی پەروەردگارت بکە، وتراوە مەبەست پێنج فەرزیە لەگەڵ سوننەتەکانیاندا جا ئەو زیکرانەی کە دەکرێت لە نوێژدا هەر تەسبیحاتو سوپاس و ستایشی خودایە. ئینجا دەفەرموێ:

(٤١) ئەو ڕۆژەی کە بانگکەرێك لە جێگایەکی نزیکەوە بانگ دەکات گوێی بۆ بگرە.

(٤٢) ئەو ڕۆژەی کە نەعرەتە ڕاستەکە دەبیستن، کە بانگ دەکرێت ئەی ئێسكو پروسکە ڕزیوەکان، ئەی جومگە پارچە پارچە بووەکان، بێگومان کە خودا فەرمان دەدات کە ڕاست ببنەوەو یەك بگرن بۆ جیاکردنەوەی بڕیارەکانو وەرگرتنەوەی تۆڵەی کارو کۆششەکانتان چاکە بە چاکەو خراپەیش بە سزاو ئەشکەنجە، جا

وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ (٧) إِنَّكُمْ لَفِي قَوْلٍ مُّخْتَلِفٍ (٨) يُؤْفَكُ عَنْهُ مَنْ أُفِكَ (٩) قُتِلَ الْخَرَّاصُونَ (١٠) الَّذِينَ هُمْ فِي غَمْرَةٍ سَاهُونَ (١١) يَسْأَلُونَ أَيَّانَ يَوْمُ الدِّينِ (١٢) يَوْمَ هُمْ عَلَى النَّارِ يُفْتَنُونَ (١٣) ذُوقُوا فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا الَّذِي كُنتُم بِهِ تَسْتَعْجِلُونَ (١٤) إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ (١٥) آخِذِينَ مَا آتَاهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ (١٦) كَانُوا قَلِيلًا مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ (١٧) وَبِالْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ (١٨) وَفِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ (١٩) وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ (٢٠) وَفِي أَنفُسِكُمْ ۚ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١) وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ (٢٢) فَوَرَبِّ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ لَحَقٌّ مِّثْلَ مَا أَنَّكُمْ تَنطِقُونَ (٢٣) هَلْ أَتَاكَ حَدِيثُ ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ الْمُكْرَمِينَ (٢٤) إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا ۖ قَالَ سَلَامٌ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ (٢٥) فَرَاغَ إِلَىٰ أَهْلِهِ فَجَاءَ بِعِجْلٍ سَمِينٍ (٢٦) فَقَرَّبَهُ إِلَيْهِمْ قَالَ أَلَا تَأْكُلُونَ (٢٧) فَأَوْجَسَ مِنْهُمْ خِيفَةً ۖ قَالُوا لَا تَخَفْ ۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ (٢٨) فَأَقْبَلَتِ امْرَأَتُهُ فِي صَرَّةٍ فَصَكَّتْ وَجْهَهَا وَقَالَتْ عَجُوزٌ عَقِيمٌ (٢٩) قَالُوا كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ ۖ إِنَّهُ هُوَ الْحَكِيمُ الْعَلِيمُ (٣٠)

ئەو ڕۆژەیە ڕۆژی هاتنەدەر لە گۆڕەکان‌و زیندوبونەوەی مرۆڤ و زیندەوەرانی تر بۆ حیساب.

(٤٣) بێگومان کە ئێمەین زیندو دەکەینەوەو دەمرێنین‌و هەر بۆ لای ئێمەیشە گەڕانەوە.

(٤٤) ئەو ڕۆژەی کە زەوی لەسەریان لەت دەبێت‌و ئەوان زیندو دەکرێنەوە کە ئەوەش کۆکردنەوەیەکی ئاسانە لەلای ئێمە. پێغەمبەر دەفەرموێ: {كُلَّ ابنِ آدَمَ تَأكُلُهُ الأَرضُ إلا عَجبَ الذَّنْبِ مِنهُ يَنْبُتُ وَيُرْسِلُ اللهُ ماءَ الحياةِ فَيَنبُتونَ فِيهِ نَباتَ الخضرِ حَتَّى إِذَا أخرجت الأجساد أَرسَلَ اللهُ الأَروَاحَ وَكانَ كُلُّ روحٍ أسرعَ إلى صَاحِبِهِ مِنَ الطَّرْفِ ثُمَّ ينفخ فِي الصور فَإذا هُم قيامٌ يَنظرون./ النسائي، صحيح الالباني/ زەوی هەمو جەستەی بینامێك دەخواتو دەیرزێنێت جگە لە ئیسکی کلێنچك نەبێت کە دوبارە لەو سەوز دەبێتەوەو گەشە دەکات کاتێك الله ئاوی ژیانەوە دەنێرێت جا گەشەدەکەنو جا ئەوکاتەی کە جەستەکان دێنەدەر الله ڕۆحەکانیان دەنێرێت جا هەر ڕۆحێك بە خێرایی چاوتروکانێك دەگاتە لای خاوەنەکەی پاشان فو دەکرێت لە سوردا جا لەپڕدا هەڵدەستن و دەنوارن و چاوەڕوانی دەکەن کە چیان بەسەر دێت. }

لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {أنا أَوَّلُ مَن تَنشَقُّ عَنهُ الأَرض/ متفق عليه/ من یەکەم کەسم کە زەویم لەسەر لەت دەبێت بۆ هاتنەدەرەوەم}

(٤٥) ئێمە زاناترین بەو شتانەی کە دەیڵێن، وە تۆ خاوەنی زۆر نیت بەسەر ئەواندا کە باوەڕیان پێبهێنیت، ئەوەیش داوانەکراوە لە تۆ، جا تۆ ئەو کەسەی کە لە هەڕەشەی ئێمە دەترسێت بەم قورئانە بە بیری بهێنەرەوە، ئەگەر بیری کردەوەو ڕێگای ڕاستی گرت خۆشبەخت دەبێت‌و ئەگەر هەر خەریکی کەیفو سەیران‌و خۆشی ئەم ژیانە بوو ئاوڕێکی لە پاشەڕۆژی خۆی نەدایەوە بێگومان مرۆڤێکی دۆڕاوەو پاشەڕۆژ خراوە.

## ٥١ سورەتی زاریات ٦٠

سورەتی زاریات کە سورەتی پەنجاویەکەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتووەتە خوارەوە، بە کۆی دەنگ شەست ئایەتە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی شەستوشەشەمەو پاش سورەتی **(الأحقاف)** و پێش **(الغاشية)** دابەزیوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بەو بایانەی کە بڵاوکەرەوەن.

(٢) سوێند بەو هەورانەی کە هەڵگری باری قورسی ئاون.

(٣) ئەوسا سوێند بەو کەشتیانەی کە بە ئاسانی لە ناو دەریاکاندا هاتوچۆ دەکەن.

(٤) ئەوسا سوێند بەو فریشتانەی کە دابەشکەری کاروبارەکانی مرۆڤن ئەوانەی کە پەیوەندیان بە مرۆڤەوە هەیە وەك مەئمورەکانی نوسەری کردارەکان‌و ڕۆزی‌و باران‌و شتی تر.

(٥) بێگومان ئەوەی کە بەڵێنتان پێدراوە ڕاستەو هەر بەو چەشنەی کە وتراوە ڕوودەدات.

(٦) بەڕاستی ئەو قیامەتەی کە حیساب‌و تۆڵەو پاداشتی تێدایە ڕاستەو دێتەدی.

(٧) سوێند بەو ئاسمانەی کە جوانەو خاوەنی ڕێگای زۆرە کە وەك قژی لول دەردەکەوێت، ئەگەر لە جێگای نزیکەوە تەماشای بکرێت

(٨) بێگومان ئێوە قسەتان یەك ناگرێتەوە، هەر یەکەی قسەیەك دەکەن سەبارەت بەم قورئانەو بە پێغەمبەر ﷺ .

(٩) لادەدرێ لەو قورئانە ئەو کەسەی کە لەعیلمی خوادا لادراوە.

(١٠) دەك لەناو بچن ئەو کەسانەی کە بە گۆترە قسەو بڕیار دەدەن‌و دەڵێن زیندوبونەوە نیە. جا ئەوانە کێن؟

(١١) ئەو كەسانەن كە كەوتونەتە گێژاوی نەزانینەوەو لە قیامەت بێ ئاگان.

(١٢) كە دەپرسن‌و دەڵێن: ڕۆژی قیامەت كەی دێت؟ بڵێ:

(١٣) ئەو ڕۆژە دێت كە ئەوان لەسەر ئاگر رایان دەگرن‌و سزا دەدرێن.

(١٤) جا پێیان دەوترێت بچەژن سزای ئەو كردارە خراپانەی خۆتان ئەوە ئەو رۆژەیە كە لە پێشدا زۆر بۆی بەپەلە بون‌و هەر دەتان وت: كەی دێت ئەو رۆژەو گاڵتەتان پێی دەهات؟

(١٥) بێگومان ئەو رۆژە كە هات پارێزكاران لەناو باخچەیان‌و كانی ئاوانی زۆردان.

(١٦) جا ئەوەی كە پەروەردگاری خۆیان بۆی داناون هەموی وەردەگرن بێگومان كە ئەوان پێش ئەوەی بچنە ئەو بەهەشتەوە لە دنیادا چاكە كاربون .

(١٧) ئەوان كەمێك لە شەو دەخەوتن‌و زۆرتر بە نوێژو بەندایەتیەوە خەریك دەبون. پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَفْشُوا السَّلَامَ وَأَطْعِمُوا الطَّعَامَ وَصَلُّوا بِاللَّيْلِ وَالنَّاسُ نِيَامٌ تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ بِسَلَامٍ./ الترمذي، الألباني: صحيح/ ئەی خەڵكینە زۆر سەلام بكەن‌و خواردن بدەن‌و شەونوێژ بكەن لە كاتێكدا كەخەڵكی خەوتوە، بەئەمن‌و ئەمانەوە دەچنە بەهەشتەوە}

(١٨) جا بەرەبەیانیان داوای لێبوردنیان لە خوا دەكرد، لە فەرمودەدا هاتووە كە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {إِنَّ اللهَ يَنزِلُ كُلَّ لَيلَةٍ إلَى سَمَاءِ الدُّنيا حِينَ يَبقَى ثُلُثُ اللَّيلِ الأَخِيرِ، فَيَقُولُ: هَل مِن تَائِبٍ فَأَتُوبُ عَلَيهِ؟ هَل مِن مُستَغفِرٍ فَأَغفِرَ لَهُ؟ هَل مِن سَائِلٍ فَيُعطى سُؤلَهُ؟ حَتَّى يَطلع الفجر/متفق عليه/ بێگومان هەمو شەوێك كاتێك كە بەشی سێهەمی دەمێنێت ﷻ دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیا بەو شێوەی كە شایستە بەوەو دەفەرموێ: ئایا كەسێك هەیە تەوبە بكات تا تەوبەی لێوەربگرم؟ ئایا كەسێك هەیە كە داوای لێبوردن بكات تا لێی ببورم؟ ئایا كەسێك هەیە داوای شتم لێ بكات تا داواكاریەكەی پێ بدرێت؟ هەتا رۆژ دەبێتەوە كە كاتی بانگی بەیانیە} جا سیفەتێكی تری پەرهیزكاران باس دەكات‌و دەفەرموێ:

(١٩) خۆ لەناو ماڵ‌وسامانیاندا بەشێكیش هەیە بۆ داواكاران‌و بێ بەشان.كە هەمیشە نزای خێری فریشتەی جارچی دەیانگرێتەوە . ئینجاﷻ سرنجی مرۆڤ بۆ چەند نیشانەیەكی گرنگی دەسەڵاتی خۆی رادەكێشێ‌ودەفەرموێ:

(٢٠) خۆ لەو زەویەدا چەندین نیشانە هەیە لەسەر تەنهایی‌و دەسەڵات و زانایی‌و كاربەجێیی ﷻ بۆ ئەو كەسانەی كە هیچ گومانێك نیە لە بیرو باوەڕیاندا. بەڵێ بەراستی هەر ئەوان سوودی لێ وەردەگرن ئەگینا ئەو بەڵگانە بۆ هەمو خەڵكە،

(٢١) جا لەناو خۆیشیاندا دیسان چەندین بەڵگەی گەورەو بچوك، دیارو نادیار هەیە، دەی ئایا چاو نادڕنەوەو بەجوانی تەماشای خۆیان‌و پێكهاتەی لەشی خۆیان بكەن‌و گەورەیی‌و عەزەمەتی ﷻ یان بۆدەركەوێت؟

(٢٢) ڕۆزیتان‌و هەر بەڵێنێكتان پێدەدرێت هەر لە ئاسمانەوەیەو بەدەست خوایەو كەس لەو بارەوە هیچی پێ ناكرێت، بەڕاستی ئەم تاكە ئایەتە بەسە بۆ باوەڕدار كە سەر بۆ كەس شۆڕ نەكات‌و ترسی لە كەس نەبێت، چونكە ئەوەی كە مرۆڤ لە دنیادا لێی دەترسێت كە لە دەستی بدات ڕۆزی‌و تەمەنیەتی كە ئەم دووانەش هەر لە دەست ﷻدان‌و كەس زیادو كەمی پێ ناكرێت، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لَوْ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَوَكَّلُونَ عَلَى اللَّهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ أَلَا تَرَوْنَ أَنَّهَا تَغْدُو خِمَاصًا وَتَرُوحُ بِطَانًا/ أحمد، صححه الألباني/ بێگومان ئەگەر ئێوە پشت ببەستن بەخوا بە پشت بەستنێكی راست بەدڵنیاییەوە رۆزیتان پێدەدات هەروەك چۆن كە رۆزی دەدات بە باڵندە، ئایا نابینن كەبەیانی دەردەچێت بەسكی خاڵی‌و ئێوارە دەگەڕێتەوە بەسكی پڕ؟} دەی ئیتر ترس لە جگە لەﷻ بۆچی؟! ئەی باوەڕداران بیر بكەنەوەو بیروباوەڕتان چاك بكەن‌و پەروەردگارتان باش بناسن‌و یەقینتان بەنیشانەكانی هەبێ.

(٢٣) سا سوێند بە پەروەردگاری ئاسمان‌و زەوی ئەوەی كە بەڵێنتان پێدراوەو ئەم قورئانە ڕاستەو هەروەكو چۆن ئێوە لەناو خۆتاندا قسە دەكەن‌و دەزانن خۆتانن قسە دەكەن هەر ئاوەها ئەم قورئانەو ئەو بەڵێنانەی كە پێتان دراوە ڕاستەو گومانی تێدانیە.

(٢٤) ئایا قسەی مێوانە بەڕێزەكانی ئیبراهیمت پێگەیشتووە،

(٢٥) ئەو كاتەی كە هاتنە لای‌و وتیان: سەلام، ئەویش بەباشتر لە وان وەڵامی دانەوەو وتی: سەلام، واتە سەلامیان لێكردو، ئەویش بە سەلام لێكردنیان وەڵامی دانەوەو ئیبراهیم ﷵ وتی: گەلێكی نەناسراون.

(٢٦) جابەهێواشی‌و بەدزیەوە خۆی گەیاندە خاوخێزانی‌و باسی مێوانەكانی بۆكردو خواردنێكی چاكیان بۆ ئامادە كردن كە گوێرەكەیەكی قەڵەوی برژاو بو بۆی هێنان.

۞ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣١﴾ قَالُوٓاْ إِنَّآ أُرْسِلْنَآ إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٣٢﴾ لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ ﴿٣٣﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ لِلْمُسْرِفِينَ ﴿٣٤﴾ فَأَخْرَجْنَا مَن كَانَ فِيهَا مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣٥﴾ فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِّنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٦﴾ وَتَرَكْنَا فِيهَآ ءَايَةً لِّلَّذِينَ يَخَافُونَ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٣٧﴾ وَفِي مُوسَىٰٓ إِذْ أَرْسَلْنَٰهُ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ بِسُلْطَٰنٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ فَتَوَلَّىٰ بِرُكْنِهِۦ وَقَالَ سَٰحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ ﴿٣٩﴾ فَأَخَذْنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذْنَٰهُمْ فِي ٱلْيَمِّ وَهُوَ مُلِيمٌ ﴿٤٠﴾ وَفِي عَادٍ إِذْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلرِّيحَ ٱلْعَقِيمَ ﴿٤١﴾ مَا تَذَرُ مِن شَيْءٍ أَتَتْ عَلَيْهِ إِلَّا جَعَلَتْهُ كَٱلرَّمِيمِ ﴿٤٢﴾ وَفِي ثَمُودَ إِذْ قِيلَ لَهُمْ تَمَتَّعُواْ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٤٣﴾ فَعَتَوْاْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَهُمْ يَنظُرُونَ ﴿٤٤﴾ فَمَا ٱسْتَطَٰعُواْ مِن قِيَامٍ وَمَا كَانُواْ مُنتَصِرِينَ ﴿٤٥﴾ وَقَوْمَ نُوحٍ مِّن قَبْلُ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَوْمًا فَٰسِقِينَ ﴿٤٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ بَنَيْنَٰهَا بِأَيْيْدٍ وَإِنَّا لَمُوسِعُونَ ﴿٤٧﴾ وَٱلْأَرْضَ فَرَشْنَٰهَا فَنِعْمَ ٱلْمَٰهِدُونَ ﴿٤٨﴾ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿٤٩﴾ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥٠﴾ وَلَا تَجْعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ إِنِّي لَكُم مِّنْهُ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٥١﴾

﴿٢٧﴾جانزیکی کردەوە لێیان بەڵام ئەوان دەستیان بۆ نەبردو نەیان خوارد ئیبراهیم عليه السلام وتی: ئەوە بۆ ناخۆن؟!

﴿٢٨﴾ ترسا کە نیەتیان باش نەبێت (چونکە نان نەخواردن لەناو عەرەبدا بەڵگەی یەك نەویستنەو بەتەمای کەتنن سەبارەت بەو خاوەن ماڵە) جا کە ئەوانیش هەستیان بە نارەحەتی ئیبراهیم عليه السلام کرد، وتیان: مەترسەو مژدەیان پێدا بە کوڕێکی زانا، چونکە ئیبراهیم عليه السلام تا ئەو کاتە منالّیان نەبوبو خۆیشیو خێزانەکەیشی تەمەنێکی باشیان کردبو.

﴿٢٩﴾جا ژنەکەی بە هاوارەوە هاتو دای بەناو روومەتی خۆیداو وتی: من پیرەژنێکی بێ سكو زام منداڵم چۆن دەبێت؟ جا ئەو مێوانە بەرێزانە وەڵامیان دایەوە.

﴿٣٠﴾وتیان: بەڵێ هەر ئاوەهایەو منداڵت دەبێت کە پەروەردگارت فەرمویەتی، بێگومان کە ئەو هەر خۆیەتی داناو زانا.

﴿٣١﴾ئیبراهیم کە ترسی نەماو مژدەی کوڕیشیان پێدا، خۆ ئەو هەر مرۆڤێکی دڵسۆزەو دەیەوێت بزانێت کاری ئەوانە چی ترە؟ فەرموی: ئەی نێرراوەکان ئەی بۆ چ کارێکی گەورەی تر هاتوون؟

﴿٣٢﴾وتیان: بێگومان ئێمە رەوانە کراوین بۆ سەر گەلێکی تاوانبار کە گەلی لوتە.

﴿٣٣﴾تا بدەین بەسەریاندا بە بەردی لەقوڕ دروستکراو.

﴿٣٤﴾کە لەلایەن پەروەردگارتەوە دیاریکراوە بۆ ئەوانەی کە لە سنور تێپەڕیونو گوێ لە هیچ ئامۆژگاریکەرێك ناگرن.

﴿٣٥﴾ئەوسا ئێمەش ئەوەی کە باوەڕدار بو لەو شوێنەدا دەرمان کردن.

﴿٣٦﴾خۆ جگە لە ماڵێکی موسڵمانیش کەسی ترمان لەو شوێنەدا دەست نەکەوت کە لوتو دوو کچەکەی بون کە بەباوەڕدارو موسڵمان (المُؤمن و المُسلِم) خودا ناوی هێناون واتە: خاوەنی بیروباوەڕێکی راستو دروستو کردار گەلێکی پاکیان هەبوە.

﴿٣٧﴾جا لەوێدا نیشانەیەکی گەورەمان دانا بۆ ئەو کەسانەی کە لە سزای بەژان دەترسن. تابیرلە بەسەرهاتی ئەو گەلە بکەنەوە.

﴿٣٨﴾خۆلە داستانی موسایشدا عليه السلام پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ خەڵکی لە خواترس ئەو کاتەی کە ناردمان بۆ لای فیرعەون بە بەڵگەی ئاشکراوە، کەدەستو عەساکەی بو.

﴿٣٩﴾ جا ئەو نەك باوەڕی نەکرد، بەڵکو پشتی کردە راستیو باوەڕی نەهێنا لەگەڵ هەمو هێزو پاڵپشتەکانیداو وتیان: جادووگەرە یان شێتە، جا خوا ڕقی لێ هەستانو دەفەرموێ:

﴿٤٠﴾ئەوسا ئێمەش خۆیو سەربازەکانیمان بە توندی گرتو فڕەماندانە ناو دەریاوە لە حاڵێکدا کە ئەو سەرزەنشت دەکرێ.

﴿٤١﴾ جا هەروەها لە داستانی گەلی عادیشدا بەڵگەی گەورە هەیە بۆ پەندو ئامۆژگاری دڵ زیندووان ئەو کاتەی کە بایەکی بێ خێرمان بۆ ناردن.

﴿٤٢﴾کە نەیدا بەسەر هیچ کەسێکی بێباوەڕدا مەگەر کردبێتی بە پێشەی ڕزیو .

﴿٤٣﴾ خۆ هەروەهایش لە داستانی گەلی سەموددا بەڵگەی گەورە هەیە بۆ پەند لێ وەرگرتن ئەو کاتەی کە وشترەکەیان کوشتو پێیان وترا ڕابوێرن تا کاتی هاتنی سزا پاش سێ ڕۆژ.

﴿٤٤﴾جا ئەوان لە فەرمانی پەروەردگاری خۆیان لایان دا، ئەوسا نەعرەتەیەك گرتنی لەحاڵێکدا تەماشایان دەکرد، جا نە توانای لادانی ئەو سزایان هەبو نە توانای خۆگوریزدان لێی.

﴿٤٥﴾جا نەیانتوانی ڕاست ببنەوەو دژایەتی بکەنو نەشیان توانی تۆڵەی خۆیان وەربگرنەوە، لەراستیدا ئەوە گاڵتە کردنە پێیان چونکە لەدنیادا زۆر بەتواناوهێزی خۆیاندا دەنازین.

﴿٤٦﴾خۆ گەلی نوحیش لەپێشدا سزادرانو کران بە پەند بۆ پاش خۆیان چونکە بێگومان ئەوانیش گەلێك بون لەسنور تێپەڕی

بون. جارێکی تر سرنجمان بەرەودەسەڵاتی خۆی رادەکێشی‌و دەفەرموێ:

(٤٧) جا ئەم ئاسمانانەمان کرد بە بان بۆتان‌و دروستمان کرد بە هێزو قوەتی خۆمان‌و کەس تێیدا بەشدار نەبوەوبێگومان پەرەیشی پێدەدەین‌وفرەوانتری دەکەین.

(٤٨)خۆ ئەم زەویەشمان ڕاخست بۆ دروستکراوەکانمان ئای ئێمە چەند رێك‌و پێك کارو ڕاخەرێکی چاك‌وباشین.

(٤٩) ئەوسا لە هەمو شتێکیشدا ئێمە جووتمان دروستکردوە بۆ ئەوەی بیربکەنەوەوﷲ بەچاکی بناسن‌وڕێگای ڕاست بگرن .

(٥٠) دەی بەرەو ﷲ ڕابکەن بێگومان من بۆ ئێوە لەلایەنی خۆیەوە ترسێنەرێکی ئاشکرام.

(٥١) لەگەڵ ﷲ دا هیچ خودایەکی تر مەپەرستن بێگومان من بۆ ئێوە لەلایەن خۆیەوە ترسێنەرێکی ئاشکرام.

(٥٢)هەروەکو لەگەڵ تۆدا ئەم گەلە ڕەفتاری خراپ دەکەن هەروەها هیچ پێغەمبەرێکیش نەهاتوە بۆخەڵکانی پێش خۆیان مەگەر پێیان وت بێت: جادووگەرە یان شێت. واتە تۆش نارەحەت مەبەو ئەم قسانە تازە نین کە بە تۆ دەوترێت بەڵکو خوا نەناسان تازەوکۆنیان قسەیان یەکەو وەك دوخەرێسە هەردەرێسن‌و شەرمیان لەوتنی درۆو دەلەسەنیە. جا دەفەرموێ:

(٥٣)ئایا ئەوانە پشت بە پشت ئامۆژگاریان کردوە بەیەك کە بەم جۆرە قسە بکەن (نەخێر وانیە) بەڵکو ئەوان هەر بۆ خۆیان گەلێکی سەرکەش بوون‌وهەرئەوسەرکەشیەش کردوونی بەبرای یەك‌و لەیەك دەچن.

(٥٤) سا تۆ پشتیان تێبکەو خۆتیان لێ هەڵە بکەو هیچ کەسیش گلەیی‌و گازاندە لە تۆ ناکات، واتە: ئێمە تۆ بە تاوانبار نازانین‌و لۆمەیشت ناکەین لەسەر ئەو هەڵوێستە خراپانەی ئەوان‌و لەو پشت تێکردنەت.

(٥٥)بەبیر بهێنەرەوەو باسیان بۆ بکە بێگومان بەبیر هێنانەوە سودی هەیە بۆ باوەڕداران، بەڵام بێباوەڕان هەر لەبازاڕی بێ ئاگایی خۆیاندان‌وهیچسودێك وەرناگرن. ئینجا دەفەرموێ:

(٥٦)ئەوسا من جنۆکەو مرۆڤم هەر بۆئەوە دروستکردوە کە بمپەرستن. واتە هاتنی دنیامان بۆ پەرستنی ﷲ یەو بۆ تاقی کردنەوەی پەری‌و ئینسانە هەتا لەدوارۆژدا هیچکام لەئێمە نەیبێت بەهانە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوۡ مَجۡنُونٌ ﴿٥٢﴾ أَتَوَاصَوۡاْ بِهِۦۚ بَلۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ ﴿٥٣﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡ فَمَآ أَنتَ بِمَلُومٖ ﴿٥٤﴾ وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٥٥﴾ وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ ﴿٥٦﴾ مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ ﴿٥٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ﴿٥٨﴾ فَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ ذَنُوبٗا مِّثۡلَ ذَنُوبِ أَصۡحَٰبِهِمۡ فَلَا يَسۡتَعۡجِلُونِ ﴿٥٩﴾ فَوَيۡلٞ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن يَوۡمِهِمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٦٠﴾

## سُورَةُ الطُّورِ (٥٢) (٤٩)

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلطُّورِ ﴿١﴾ وَكِتَٰبٖ مَّسۡطُورٖ ﴿٢﴾ فِي رَقّٖ مَّنشُورٖ ﴿٣﴾ وَٱلۡبَيۡتِ ٱلۡمَعۡمُورِ ﴿٤﴾ وَٱلسَّقۡفِ ٱلۡمَرۡفُوعِ ﴿٥﴾ وَٱلۡبَحۡرِ ٱلۡمَسۡجُورِ ﴿٦﴾ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ مَّا لَهُۥ مِن دَافِعٖ ﴿٨﴾ يَوۡمَ تَمُورُ ٱلسَّمَآءُ مَوۡرٗا ﴿٩﴾ وَتَسِيرُ ٱلۡجِبَالُ سَيۡرٗا ﴿١٠﴾ فَوَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي خَوۡضٖ يَلۡعَبُونَ ﴿١٢﴾ يَوۡمَ يُدَعُّونَ إِلَىٰ نَارِ جَهَنَّمَ دَعًّا ﴿١٣﴾ هَٰذِهِ ٱلنَّارُ ٱلَّتِي كُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٤﴾

(٥٧)من لەوان ڕۆزیم ناوێت‌و نامەوێت کە خواردنم بدەنێ، تا بڵێن خوا نیازی بەئێمە هەیە، نەخێر ئەو خۆی نیازی ئێمە دێنێتەجێ‌و بژێویمان پێدەدات.

(٥٨) بێگومان کە خودا هەر خۆیەتی ڕۆزیدەرو خاوەنی هێزی بتەووتوند.

(٥٩)سا بێگومان بۆ ئەو کەسانەی‌کەستەمیان کردوە بەشێکیان بۆ هەیە لە سزا هەروەکو بەشی هاوڕێ لەناوچوە پێشوەکانیان جا با پەلە نەکەن؛ دڵنیابن پێی دەگەن‌و سزای کرداری ناپەسەندی خۆیان وەردەگرن.

(٦٠)سا واوەیلا بۆ ئەو کەسانەی کە خوانەناس بون لەو ڕۆژەی کە بەڵێنیان پێدراوە کە قیامەت‌و باقی بەسەرهات‌و روداوە گەورەوسەختە کانیەتی.

## سورەتی تور (٥٢) (٤٩)

سورەتی تور کە سورەتی پەنجاو دووهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتۆتە خوارەوەو چل‌و نۆ ئایەتە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی حەفتاو پێنجەمەو پاش سورەتی (نوح ) و پێش (المؤمنين) دابەزیوە، وتراوە کەناسخ‌و مەنسوخی تێدا نیە جگە لە ئایەتی ﴿واصبر لحكم ربك فإنك بأعيننا... الآية ﴾ کە بە ئایەتی "شمشێر"

أَفَسِحۡرٌ هَٰذَآ أَمۡ أَنتُمۡ لَا تُبۡصِرُونَ ﴿١٥﴾ ٱصۡلَوۡهَا فَٱصۡبِرُوٓاْ أَوۡ لَا تَصۡبِرُواْ سَوَآءٌ عَلَيۡكُمۡۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَعِيمٖ ﴿١٧﴾ فَٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖۖ وَزَوَّجۡنَٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴿٢٠﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ وَمَآ أَلَتۡنَٰهُم مِّنۡ عَمَلِهِم مِّن شَيۡءٖۚ كُلُّ ٱمۡرِيِٕۭ بِمَا كَسَبَ رَهِينٞ ﴿٢١﴾ وَأَمۡدَدۡنَٰهُم بِفَٰكِهَةٖ وَلَحۡمٖ مِّمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٢٢﴾ يَتَنَٰزَعُونَ فِيهَا كَأۡسٗا لَّا لَغۡوٞ فِيهَا وَلَا تَأۡثِيمٞ ﴿٢٣﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ غِلۡمَانٞ لَّهُمۡ كَأَنَّهُمۡ لُؤۡلُؤٞ مَّكۡنُونٞ ﴿٢٤﴾ وَأَقۡبَلَ بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٢٥﴾ قَالُوٓاْ إِنَّا كُنَّا قَبۡلُ فِيٓ أَهۡلِنَا مُشۡفِقِينَ ﴿٢٦﴾ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡنَا وَوَقَىٰنَا عَذَابَ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلُ نَدۡعُوهُۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡبَرُّ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٨﴾ فَذَكِّرۡ فَمَآ أَنتَ بِنِعۡمَتِ رَبِّكَ بِكَاهِنٖ وَلَا مَجۡنُونٍ ﴿٢٩﴾ أَمۡ يَقُولُونَ شَاعِرٞ نَّتَرَبَّصُ بِهِۦ رَيۡبَ ٱلۡمَنُونِ ﴿٣٠﴾ قُلۡ تَرَبَّصُواْ فَإِنِّي مَعَكُم مِّنَ ٱلۡمُتَرَبِّصِينَ ﴿٣١﴾

نەسخ بوەتەوە، پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی مەغریبدا سورەتی توری خوێندوە.

بەناوی الله ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە کێوی تور ئەو چیایەی کە خوای بالادەست لەگەڵ موسادا گفتوگۆی کردوە.

(٢) وە سوێند بە پەڕوای دێڕ دێڕ نوسراو.

(٣) لەناو پێستو کاغەزو شتی تر کەبلاودەکرێتەوە بۆ خوێندنەوە کە قورئانە، وەدەشگونجێ هەمو پەڕاوەکانی خوابێ.

(٤) جا سوێندیش بەوماڵە ئاوەدانە (بيت المعمور) کە لە ئاسمانی حەوتەمدایەو فریشتەکان تەوافی دەکەن هەروەك لە زەویدا خەڵکی تەوافی کەعبە دەکەن.

لە فەرمودەدا هاتووە کە شەوی میعراج پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: پاش ئەوەی کە لە ئاسمانی حەوتەمدا تێپەڕیم {ثُمَّ رُفِعَ إلى البَيتِ المَعمورِ وَإذا هو يَدخُلُهُ في كُلِّ يَومٍ سَبعونَ ألفاً لا يَعودونَ إلَيهِ آخِرُ ما عَلَيهِم/ متفق عليه/ پاشان بەرزکراوەتەوە بۆ (بيت المعمور) کەچی دی هەمو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ناویەوە بۆ تەوافو جارێکی تر ناگەڕێنەوە بۆ تەوافکردنی، دواجارە لەسەریان، واتە: هەریەك جاریان بەردەکەوێت}.

(٥) سا سوێند بەو بانەی کە بەرزکراوەتەوە کە ئاسمانە.

(٦) وە سوێند بەو دەریایەی کە لێوان لێوە، سوێند بەو پێنج شتانە.

(٧) بێگومان سزای پەروەردگارت بۆ ستەمکاران دێتە دی.

(٨) هیچ پاڵنەرێکیشی نیە کە لای بدات لەسەر ئەوان.

(٩) ئەو ڕۆژەی کە ئاسمان دەجوڵێت جا چۆن جوڵاندنێك و چیاکان دەڕۆن چ ڕۆیشتنێك.

(١٠) ئەوسا واوەیلا لەو ڕۆژەدا بۆ ئەو کەسانەی کە پێغەمبەرانیان بەدرۆ خسبێتەوەو باوەڕیان پێ نەهێنابێت.

(١١) ئەوکەسانەی کە لەدەریای بێ ئاگایی‌و شتی پڕو پوچدا یاری دەکەن.

(١٣) ئەو ڕۆژەی کە بە پاڵنان بەرەو ئاگری دۆزەخ پاڵدەنرێن،

(١٤) جا پێیان دەوترێت: ئەمە ئەو ئاگرەیە کە ئێوە باوەڕتان پێی نەبو.

(١٥) ئایا ئەمە جادووە یان ئێوە چاوتان نابینێت؟ بەم شێوەیە لەوڕۆژەدا گاڵتەیان پێدەکرێت.

(١٦) جاپێیان دەوترێت: بچنە ناویەوە، سا ئیتر لەسەر ئەو ئاگرە خۆتان بگرن یان خۆتان نەگرن یەکسانە بۆتان؛ چونکە ئەو خۆگرتنەتان هیچ سوودێکتان پێ نادات، ئەوە هەر تۆڵەی ئەوەیە کە کردووتانەو خوا ستەم لە کەس ناکات.

(١٧) بێگومان پارێزکاران لەناو باخچەگەل‌و نازو نیعمەتدان.

(١٨) ڕادەبوێرن‌و شادمانن بەوەی کە پەروەردگاریان پێی بەخشیون‌و پەروەردگاریان لە سزای دۆزەخ پاراستوونی. ئەوسا پێیان دەوترێت:

(١٩) بخۆن‌و بخۆنەوە لە باتی ئەوەی کە کردوتانەو نۆشی گیانتان بێت.

(٢٠) لەسەر تەختی ڕیزکراو پاڵ دەدەنەوەو کچی سپی‌و چاو گەورەمان پێداون.

(٢١) ئەوسا ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئەوانەش کە پەیڕەویان کردوون لە ڕۆڵەکانیان بە بیرو باوەڕ ئەوە ڕۆڵەکانیان پێدەگەیەنین لە بەهەشتداو هیچ شتێکیش لە چاکەی ئەوان کەم ناکرێتەوەو هەمو کەسێکیش لە بارمتەی کردەوەی خۆیدایە. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إنّ اللهَ لَيرفَعُ ذُريّةَ الْمُؤمنِ إليهِ في دَرَجَتِهِ وَإن كانُوا دُونَهُ في العَمَلِ لِتَقَرَّ بِهِم عَينُه ثُمّ قَرَأ ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ

ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ ..الایه ﴾ ثُمّ قَال وَمَا نَقَصْنَا الآباءَ بِما أَعطَيْنا الْبَنين /السلسلة الصحيحة/ بێگومان کەاللَّهُ نەوەی باوەڕدار بەرز دەکاتەوە بۆ لای هەرچەند لەکرداری چاکیشدا لەپلەی ئەودا نەبێت تا چاوی بەوان رۆشن بکاتەوە، لەپاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ ..الایه ﴾ پاشان فەرموی: خوا فەرموی: ئێمە لە پاداشتی باوکانمان کەم نەکردوەتەوە بەهۆی ئەو بەخششەی کەداومانە بەمناڵەکانیان} بەڵێ مناڵی باوەڕداران مادام باوەڕیان هێنابێت دەگەیەنرێت بە پلەی بەرزی باوکانیان لە بەهەشتدا.

(٢٢) جا میوەی فرەوان‌و هەر گۆشتێك کە ئارەزۆی بکەن پێمان داون.

(٢٣) لەوێدا پیاڵەی شەراب بەیەکتر دەگۆڕنەوە، جا نە قسەی پڕو پوچی تێدایەو نەگوناهباریش دەبن تێیدا. بەڵکو هەر کەیف‌و سەیران‌و سەلام سەلامە

(٢٤) جا خزمەتکاری تازە پێگەیشتوی کوڕانیان هەیە کە بە خزمەتکردنیان سەرگەرمن ئەوەندە سپین هەروەکو دانەی مروارین لەناو توێکڵداو هەرگیز تۆزی لێ نەکەوتبێت.

(٢٥) ڕوودەکەنە یەکترو لە یەکتر دەپرسن لەو نازو نیعمەتەی کە خودا پێی داون چۆن ئەو خێرە گەورەیان دەستکەوتوە؟

(٢٦) دەڵێن: بۆیە ئەمەمان پێدراوە چونکە بێگومان ئێمە لە دنیادا لەناو خاوخێزانی خۆماندا لە خودا دەترساین‌و خۆمان لەو شتانە دەپاراست کە خودا لێمان تورە ببێت.

(٢٧) جا خوا ئەم چاکەیەی لەگەڵ ئێمەدا کردو لەو سزا ژەهراویە پڕ ژانەی پاراستین.

(٢٨) بێگومان ئێمە لە دنیادا هەر ئەومان دەپەرست چونکە ئەو بێگومان چاکەکارە لەگەل بەندەکانیداوزۆر میهرەبانە.

(٢٩) سا تۆ بیریان بخەرەوەو ئامۆژگاریان بکەو گوێ مەدە قسەی ئەوان کە دەڵێن: کولێنانیە یان شێتە چونکە تۆ نە کولێنانیت نە شێتیت.

(٣٠) یان دەڵێن: شاعیرەو چاوەڕێ دەکەین تا دەمرێت‌و پاشان دەنگوباسی نامێنێت.

(٣١) تۆش بڵێ: چاوەڕێ بکەن ئەوسا منیش لەگەڵتاندا لەچاوەڕێ کەرانین.

أَمۡ تَأۡمُرُهُمۡ أَحۡلَٰمُهُم بِهَٰذَآۚ أَمۡ هُمۡ قَوۡمٞ طَاغُونَ (٣٢) أَمۡ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُۥۚ بَل لَّا يُؤۡمِنُونَ (٣٣) فَلۡيَأۡتُواْ بِحَدِيثٖ مِّثۡلِهِۦٓ إِن كَانُواْ صَٰدِقِينَ (٣٤) أَمۡ خُلِقُواْ مِنۡ غَيۡرِ شَيۡءٍ أَمۡ هُمُ ٱلۡخَٰلِقُونَ (٣٥) أَمۡ خَلَقُواْ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۚ بَل لَّا يُوقِنُونَ (٣٦) أَمۡ عِندَهُمۡ خَزَآئِنُ رَبِّكَ أَمۡ هُمُ ٱلۡمُصَۜيۡطِرُونَ (٣٧) أَمۡ لَهُمۡ سُلَّمٞ يَسۡتَمِعُونَ فِيهِۖ فَلۡيَأۡتِ مُسۡتَمِعُهُم بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٍ (٣٨) أَمۡ لَهُ ٱلۡبَنَٰتُ وَلَكُمُ ٱلۡبَنُونَ (٣٩) أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ (٤٠) أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ (٤١) أَمۡ يُرِيدُونَ كَيۡدٗاۖ فَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ هُمُ ٱلۡمَكِيدُونَ (٤٢) أَمۡ لَهُمۡ إِلَٰهٌ غَيۡرُ ٱللَّهِۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ (٤٣) وَإِن يَرَوۡاْ كِسۡفٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ سَاقِطٗا يَقُولُواْ سَحَابٞ مَّرۡكُومٞ (٤٤) فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ (٤٥) يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ (٤٦) وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ (٤٧) وَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ حِينَ تَقُومُ (٤٨) وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡهُ وَإِدۡبَٰرَ ٱلنُّجُومِ (٤٩)

## سُورَةُ النَّجۡمِ ٥٣ — ٦٢

(٣٢) ئایا خەونەکانیان فەرمانیان پێدەکات بەمە کە بڵێن ئەو کولێنانیە یان شێتە یان شاعیرە؟ یان ئەوان هەر بۆ خۆیان گەلێکی یاخی‌وسەرکەشن؟

(٣٣) یان دەڵێن ئەمە قسەیەکە وخۆی لە سینەی خۆی هەڵیدەبەستێت؟ نەخێر هیچ کام لەوانە نیە بەڵکو ئەوان باوەڕ ناهێنن،

(٣٤) ئەگەر ڕاست دەکەن‌و ئەمە دەست هەڵبەستە دەی با قسەیەکی وەك ئەوەم بۆ بهێنن.

(٣٥) ئایا هەر لە خۆیانەوە بەبێ دروستکەرێك دروستبوون؟ یان ئەوان خۆیان دروستکەرن؟

(٣٦) یان ئایا ئەوان ئاسمانان‌و زەوییان دروستکردوە؟ نەخێر، بەڵکو ئەوان ئەم ڕاستیە ناسەلمێنن‌و لە گوماندان.

(٣٧) یان ئایا لەلای ئەوانە گەنجینەی پەروەردگارت تا بەکەیفی خۆیان کێ دەکەن بە پێغەمبەرو چی بە کەس دەدەن بە مەیلی ئەوان بێت؟ یان ئایا هەرئەوانن دەسەلاتدارو زاڵن‌و دەبێت بەگوێرەی داخوزی ئەوان ئیش بکرێت؟

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَاسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰ إِلَىٰ عَبْدِهِ مَا أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَىٰ ﴿١١﴾ أَفَتُمَارُونَهُ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ الْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ الْمَأْوَىٰ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَىٰ ﴿١٨﴾ أَفَرَأَيْتُمُ اللَّاتَ وَالْعُزَّىٰ ﴿١٩﴾ وَمَنَاةَ الثَّالِثَةَ الْأُخْرَىٰ ﴿٢٠﴾ أَلَكُمُ الذَّكَرُ وَلَهُ الْأُنثَىٰ ﴿٢١﴾ تِلْكَ إِذًا قِسْمَةٌ ضِيزَىٰ ﴿٢٢﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا أَسْمَاءٌ سَمَّيْتُمُوهَا أَنتُمْ وَآبَاؤُكُم مَّا أَنزَلَ اللَّهُ بِهَا مِن سُلْطَانٍ ۚ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا الظَّنَّ وَمَا تَهْوَى الْأَنفُسُ ۖ وَلَقَدْ جَاءَهُم مِّن رَّبِّهِمُ الْهُدَىٰ ﴿٢٣﴾ أَمْ لِلْإِنسَانِ مَا تَمَنَّىٰ ﴿٢٤﴾ فَلِلَّهِ الْآخِرَةُ وَالْأُولَىٰ ﴿٢٥﴾ ۞ وَكَم مِّن مَّلَكٍ فِي السَّمَاوَاتِ لَا تُغْنِي شَفَاعَتُهُمْ شَيْئًا إِلَّا مِن بَعْدِ أَن يَأْذَنَ اللَّهُ لِمَن يَشَاءُ وَيَرْضَىٰ ﴿٢٦﴾

﴿٣٨﴾ یان ئایا پەیژەیەكیان نیە كە بەسەریدا سەركەون بۆ ئاسمان‌و گوێ بگرن لە فریشتەكان جا ئەوسا ئەو بیسەرەیان بەڵگەی ڕۆشنیان بۆ بهێنێت؟

﴿٣٩﴾ یان ئایا كچ بۆ ئەوە (دەیانووت فریشتەكان كچی خودان)و كوڕ بۆ ئەوانە ؟ واتە ئەوەی كە بۆ خۆیان پێیان ناخۆشە كە كچە دایدەنێن بۆ خودا؟!

﴿٤٠﴾ یان ئایا تۆ لەسەر گەیاندنی ئەم پەیامە داوای كرێیان لێدەكەیت، جا ئەوانیش بەو بۆنەوە توشی زیان ببن‌و باریان قورس ببێت‌و نەتوانن ئەم پەیامە وەرگرن؟

﴿٤١﴾ یان ئایا نهێنی لای خۆیانە، جا ئەوسا ئەوانیش بۆ خۆیان دەنوسن‌و دژایەتی پێغەمبەری ﷺ پێدەكەن؟

﴿٤٢﴾ یان ئایا ئەوان دەیانەوێت فێڵێك بكەن‌و ئایینی پێغەمبەر بەدرۆ بخەنەوە؟ جا بادڵنیابن ئەو كەسانەی كە خوانەناسن هەر خۆیانن فێڵ لێ كراو.

﴿٤٣﴾ یان ئایا جگە لە خودا پەرستراوێكی تری ڕاستیان هەیە كە بێت بەدەمیانەوە لەكاتی تەنگانەداو لەرۆژی دوایشدا لەسزای خوا ڕزگاریان بكات؟ پاكی‌و بێ عەیبی بۆ خودا لەوەی كە ئەوان دەیكەن بە هاوبەشی خودا.

﴿٤٤﴾ خۆ ئەگەر ببینن پارچەیەك لەم ئاسمانەوە بكەوێتە خوارەوە دەڵێن: هەورێكی زۆر قایم‌و پشتدارەو دان بەسزاوتۆڵەی خودا دا نانێن تانەكەونە ناویەوە، جا ئەو كاتە داوای ڕزگار بون دەكەن‌و كەس نایەت بەهانایانەوەو دەبێ تۆڵەی سزای خۆیان وەربگرن.

﴿٤٥﴾ سا تۆ وازیان لێ بهێنە تا دەگەن بەو ڕۆژەی كە تێیدا بێهۆش دەكەون لەبەر شەرمەزاری‌و سەختی سزایان،

﴿٤٦﴾ ئەو ڕۆژەی كە ئەو فێڵەیان هیچ سوودێكیان پێنادات‌و ئەوان یارمەتی نادرێن‌و هیچ كەسیش ئاوڕیان لێ ناداتەوە.

﴿٤٧﴾ جا بێ درۆ بۆ ئەو كەسانەی كە ستەمیان كردوە سزایەكی گەورەی تر جگە لە مەی دنیا هەیە، بەڵام زۆربەی ئەوان نازانن كە ئەو ڕۆژە ڕەشە دێتە بەرەوە بۆیان بەڵكو گاڵتە بە باسكەرانیشی دەكەن.

﴿٤٨﴾ سا تۆ دان بە خۆتدا بگرە بۆ هاتنی فەرمانی پەروەردگارت، جا تۆ بێگومان لەژێر چاودێری ئێمەدایت‌و دەتبینین‌و دەتپارێزین، سا تۆ تەسبیحاتی پەروەردگارت بكە لەگەڵ سوپاسگوزاریدا ئەو كاتەی ڕاست دەبیتەوە چ لەخەو یان هەستان بۆ هەر كارێكی چاك.

﴿٤٩﴾ جا لە بەشێكی شەویشدا تەسبیحاتی بكە بە شەونوێژ كردن‌و پاش ئاوابوونی ئەستێرەكانیش تەسبیحاتی بكە بە كردنی دوو ڕكات سوننەتی پێش نوێژی بەیانی.لە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە كە فەرمویەتی:{رَكعَتَا الفَجرِ خَيرٌ مِنَ الدُّنيا وَمَا فِيهَا/مسلم وغيره/ دوو ڕكاتی نوێژی سوننەتی پێش نوێژی بەیانی چاكترە لە دنیاو لەوەی كە تێیدایە} .

## ٥٣ سورەتی نەجم ٦٢

سورەتی (النجم) یان (والنجم) كە سورەتی پەنجاو سێ هەمی قورئانە، لە مەكەدا هاتۆتە خوارەوەو شەست‌و دوو ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی بیست‌و سێ هەمەو پاش سورەتی (الإخلاص) و پێش (عبس) دابەزیوە.

عەبدوڵای كوڕی مەسعود دەڵێت:{أَوَّلُ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ فِيهَا سَجْدَةٌ وَالنَّجْمِ قَالَ فَسَجَدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَسَجَدَ مَنْ خَلْفَهُ إِلَّا رَجُلًا رَأَيْتُهُ أَخَذَ كَفًّا مِنْ تُرَابٍ فَسَجَدَ عَلَيْهِ فَرَأَيْتُهُ بَعْدَ ذَلِكَ قُتِلَ كَافِرًا وَهُوَ أُمَيَّةُ بْنُ خَلَفٍ/متفق عليه/ یەكەم سورەتێك كە هاتبێتە خوارەوەو سوجدەی تێدابێت سورەتی (والنجم) بوە، وتی: پێغەمبەری خوا ﷺ سوجدەی بردو ئەوەی لە پشتیەوەبون سوجدەیان برد، جگە لە یەك كەس كە هەندێك لە خاكی هەڵگرت‌و سوجدەی برد

بەسەریدا، دەڵێت ئەوەم بینی لە پاشدا بە کافری کوژرا، ئەویش ئومەیەی کوڕی خەلەف بو.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بەو ئەستێرەی کە بەرەو ئاوابون دەچێت.

(٢) ئەو هاوڕێتانە کە زۆر بە چاکی دەیناسن واتە محمد ﷺ نە گومڕابووەو نە لە ڕێی ڕاست لای داوە.

(٣) ئەو لە خۆیەوە قسە لەبارەی ئەم ئایینەوە ناکات.

(٤) ئەو قورئانە جگە لە وەحیەك کە بۆی ڕەوانەکراوە شتێکی تر نییە. ئەمە هەندێك دەیکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوە کە سونەتی پێغەمبەرﷺ وەحیەو لە لایەن پەروەردگارەوەیە. بەڵێ پێغەمبەران بۆیان بوە کە ئیجتیهاد بکەن، جا ئەگەر لە ئیجتیهادەکەیاندا نەیان پێکابێت خوا ئاگاداری کردونەتەوە، دەی کەواتە لەهەر قسەیەکیان ئاگادار نەکراونەتەوە دیارە پێکاویانەو خودا ئەوەی مەبەستە، جا دەر دەکەوێت کە پێغەمبەران لەبارەی ئایینەوەهیچ قسەیەکی ئارەزۆکاریان نەکردوە، چونکە نێردراوی خوداو دەبێ ئەو چۆنی دەوێت ئاوابڵێن بە بێ کەمو زیاد خۆ ئەگەر بەئیجتیهادیش شتێکیان ئەنجام دابێتو ڕاستیان نە پێکابێ وەك وتمان خوا ئاگاداری کردونەتەوەوڕاستیەکەی پێگەیاندون. ئینجا دەفەرموێ:

(٥) فریشتەیەکی زۆر بە توانا کەجبرەئیلە عليه السلام ئەو وەحیەیی لەلایەنی خوداوە هێناوەو بە پێغەمبەری ﷺ گەیاندوەو شارەزای کردوە.

(٦) خاوەنی توانایی زۆرو سەرو سیما جوانو ڕێكو پێکە، جا ئەو لەلای سەریەوەی وەستا.

(٧) جا ئەو لە ڕووی ڕۆژهەڵاتەوە لەسەری سەرەوە بو پێغەمبەرمان ﷺ لە ئەشکەوتی حیرادا لە ڕۆژهەلاتی ئاسمانەوە جبرەئیلی بینی لەسەر شێوەی خۆی کە بە هەر کوێدا تەماشای دەکرد پڕی کردبو کە شەش سەد باڵی هەبوە.

(٨) پاشان نزیکبویەوە ئەوسا نزیکتر کەوتەوە.

(٩) بە ئەندازەی دوو کەوانو نزیکتریش.

(١٠) ئەوسا پەروەردگار بەهۆی جبرەئیلەوە وەحی کردە لای بەندەی خۆی کە محمدە ﷺئەوەی کە ویستی پێی بگات پێی گەیاند.

(١١) دڵی محمد ﷺ درۆی نەکرد لەوەی بە چاوی بینیبوی. ئیبنوعەباسو کەعب پێیان وایە مەبەست بینینی ﷲ یە بەڵام دایکمان عایشەو ئەبو هورەیرەو ئیبنو مەسعود رایان لەسەر ئەوەیە کە مەبەست بینینی "جبرەیل"ـە.

مەسروق دەڵێت دایکمان عایشە وتی: هەرکەس گومانی وابێت کە محمد ﷲ ی بینیوە بەراستی درۆیەکی گەورەی بەدەم ﷲ وە درستکردوە، جا منیش وتم: ئایا ﷲ نافەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ رَآهُ بِالْأُفُقِ الْمُبِينِ/ بەراستی لەراسەریەوەلەلای رۆژهەڵاتەوە بەرونی بینی﴾ ﴿وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرَى/ بەراستی جارێکی تر بینی ﴾

جا ئەویش وتی: أَنَا أَوَّلُ هَذِهِ الْأُمَّةِ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺفَقَالَ إِنَّمَا هُوَ جِبْرِيلُ لَمْ أَرَهُ عَلَى صُورَتِهِ الَّتِي خُلِقَ عَلَيْهَا غَيْرَ هَاتَيْنِ الْمَرَّتَيْنِ رَأَيْتُهُ مُنْهَبِطًا مِنْ السَّمَاءِ سَادًّا عِظَمُ خَلْقِهِ مَا بَيْنَ السَّمَاءِ إِلَى الْأَرْضِ/متفق عليه/ من یەکەم کەسی ئەم ئومەتەم کە ئەو پرسیارەی لەپێغەمبەری خوا ﷺ کردبێت، جا فەرموی: ئەوەجبرەئیل بوە بینیومە کە نەمدیوە لەسەر ئەو وێنەیە کە دروستکراوە، جگە لەو دووجارە کەدیم لەئاسمانەوە دەهاتە خوار کە گەورەییەکەی نێوان ئاسمانو زەوی پڕ کردبو}

(١٢) ئایا گومانتان هەیە لەوەی کە ئەو دەیبینێتو کێشەی لەگەڵ دەکەن؟

(١٣) سوێند بێت جارێکی تر جبرەئیلی لەسەر شێوەی خۆی بینیوە. ئیبنو مەسعود دەڵێت: {قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺرَأَيْتُ جِبْرِيلَ عَلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى وَلَهُ سِتُّ مِائَةِ جَنَاحٍ / أحمد، حسنه الألباني / پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی:لەسەر (کەنار)ی ئەوپەڕدا جبرەئیلم دی کە شەش سەدباڵی هەبو} پێغەمبەر ﷺدووجار جبرەئیلی بەو شێوەی کەدروستکراوە بینیوە جارێك لەبەینی زەویو ئاسماندا و جارێکیش لە شەوی میعراجدا.

(١٤) لەلای (سیدرە المنتهی)دا واتە داری کەناری ئەوپەڕ، پێغەمبەر ﷺ لە باسی شەوی میعراجدا فەرموی: {ثُمَّ رُفِعَتْ إِلَيَّ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَإِذَا نَبْقُهَا مِثْلُ قِلَالِ هَجَرَ وَإِذَا وَرَقُهَا مِثْلُ آذَانِ الْفِيَلَةِ قَالَ هَذِهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى وَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ /متفق عليه/ پاشان سیدرەتولمونتەها بەرزکرایەوەبۆلام کە بەرەکەی وەکو گۆزەڵە بچوکەکانی هەجەربوو گەڵاکانیشی وەك گوێی فیلان وابو، فەرموی ئەوەیە سیدرەتولمونتەها ولەوێ چوار روباریش بو}

(١٥) لەلای ئەو دار کەنارەیە باخچەی جێگای گەڕانەوەی فریشتەکانو ڕۆحی شەهیدانو پارێزکاران.

(١٦) ئەو کاتەی کە ئەو کەنارەی داپۆشی ئەوەی کە دایپۆشی لە فریشتەکانو باڵندەو نوری پەروەردگارو شتانی تر.

(١٧) چاو لێی لانەداو سەیری دەکرد، بەڵکو ڕاست چاوی پێ کەوتو لە سنوری خۆی دەرنەچوو.

إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ لَيُسَمُّونَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ تَسۡمِيَةَ ٱلۡأُنثَىٰ ﴿٢٧﴾ وَمَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍۖ إِن يَتَّبِعُونَ إِلَّا ٱلظَّنَّۖ وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـٔٗا ﴿٢٨﴾ فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٢٩﴾ ذَٰلِكَ مَبۡلَغُهُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴿٣٠﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَسَٰٓـُٔواْ بِمَا عَمِلُواْ وَيَجۡزِيَ ٱلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ بِٱلۡحُسۡنَى ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ﴿٣٢﴾ أَفَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي تَوَلَّىٰ ﴿٣٣﴾ وَأَعۡطَىٰ قَلِيلٗا وَأَكۡدَىٰٓ ﴿٣٤﴾ أَعِندَهُۥ عِلۡمُ ٱلۡغَيۡبِ فَهُوَ يَرَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَمۡ لَمۡ يُنَبَّأۡ بِمَا فِي صُحُفِ مُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ ﴿٣٧﴾ أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰ ﴿٣٨﴾ وَأَن لَّيۡسَ لِلۡإِنسَٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَنَّ سَعۡيَهُۥ سَوۡفَ يُرَىٰ ﴿٤٠﴾ ثُمَّ يُجۡزَىٰهُ ٱلۡجَزَآءَ ٱلۡأَوۡفَىٰ ﴿٤١﴾ وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلۡمُنتَهَىٰ ﴿٤٢﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَضۡحَكَ وَأَبۡكَىٰ ﴿٤٣﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَمَاتَ وَأَحۡيَا ﴿٤٤﴾

(١٨) به راستی زۆرێك له نیشانه گەورەكانی پەروەردگاری بینیوە.

(١٩) ئایا لاتو عوزات بینیوە.

(٢٠) جا مەناتی سێهەمی تریشتان بینیوە كە بە خوایان دەزانن پاش ئەو هەمو نیشانە گەورەو بتەوانەی كە باسكران سەبارەت بە تەنهایی‌و دەسەلاتو زانایی خودا؟!

(٢١) ئایا كوڕ دەبێ بۆ ئێوە بێت كچ بۆ ﷲ؟!

(٢٢) ئەگەر وابێت ئەوە بەشكردنێكی ستەمكارانەیە، شتێك كە بۆ خۆتان پێتان ناخۆشبێت بۆ خودای دابنێن!

(٢٣) ئەوانە تەنها چەند ناوێكن كە خۆتانو باو باپیرانتان ناوتان بۆ داناون هیچ بەڵگەیەكی بەهێز نەهاتوە لەلایەن خوداوە تا ئەوان بەدەستیوە بگرن، بەڵكو ئەوان هەر پەیرەوی لە گومان دەكەنو ئەوەی كە نەفس ئارەزۆی دەكات، بە راستی ئەوان لەلایەن پەروەردگاریانەوە ڕێنماییان بۆ هاتبو لەسەر زمانی پێغەمبەری خودا ﷺ بەڵام پشتگوێیان خست.

(٢٤) ئایا مرۆڤ هەرچی ئارەزۆ بكات بۆی دەبێت؟

(٢٥) ئەوسا هەر بۆ خودایە دوارۆژو دنیایش موڵكی خۆیەتی‌و چۆن ئارەزۆ بكات دەیكات و هیچ شتێكی ئەم بوونەوەرە ڕێگای پێ ناگیرێتو ناتوانێت گێرەشێوێنی لەهاتنە دی بڕیارەكانیدابكات.

(٢٦) لەو ئاسمانەدا فریشتە گەلێكی زۆر هەن كە شەفاعەتو تكای ئەوان هیچ سوودی نابێت، مەگەر پاش ئەوەی كە خودا خۆی ماوە بدە بۆ كەسێك كە ئارەزۆی لێ بێتو ڕازی بێت لێی. جا ئەمە سەبارەت بەو فریشتانە بێت كە هیچ تاوانێك ناكەن، ئیتر چۆن چاوەڕێ دەكەن لە شتانێك كە خاوەنی هیچ نین شەفاعەتتان بۆ بكەن ئەی نەزانینە؟!

(٢٧) بێگومان ئەوانەی كە باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نیە فریشتەكان بەناوی كچان ناو دەبەنو دەڵێن كچی خودان!

(٢٨) ئەوان هیچ زانیاریەكیان لەلا نیە لەسەر ئەم قسەی خۆیانە، بەڵكو هەر دوای گومانی پڕو پوچ كەوتونو گومانیش لە بازاڕی ڕاستیدا هیچ ڕەواجێكی نیەو ناتوانێت جێگای ڕاستی پڕبكاتەوە.

(٢٩) سا تۆش گوێ بەو كەسە مەدە كە لەباسی ئێمە لای داوەو مەبەستی هەر تەنها ژیانی دنیا بووە. پێغەمبەرمان ﷺ لە دوعایەكیدا فەرمویەتی: {اللهمَّ لا تَجعَلِ الدُّنيا أكبَرَ هَمِّنا ولا مَبلَغَ عِلمِنا/ ئەی خودایە دنیا مەكە بە گەورەترین مەبەستمانو نیهایەتی زانستمان}

(٣٠) ئەوەیە ئەوپەڕی ئاواتیان لە زانیاری كە خۆشی‌و ژیانی دنیایان دەستكەوێت، بێگومان پەروەردگارت هەر خۆی زاناترە بەو كەسەی كە لەڕێی ئەو لای داوەو هەر ئەویشە زاناتر بەو كەسەی كە ڕێگای ئەوی گرتوە.

(٣١) ئەوسا هەر بۆ خودایەو موڵكی ئەوە ئەوەی كە لەناو ئاسمانانو لەناوی زەویدایە تا تۆڵە وەرگرێت لەو كەسانەی كە خراپەیان كردوە بەهۆی ئەو كارە خراپانەی كە كردویانو بەو كەسانەیش كە چاكەیان كردوە بەهەشتی خۆیان پێبدات كە زۆر چاكترە لە كردارە چاكەكانیان، ئەو كەسانە چۆنن كە خودا ئەو چاكە گەورەیان لەگەڵ دەكات؟ دەفەرموێ:

(٣٢) ئەو كەسانەن كە لە گوناهە گەورەكان خۆیان دەپارێزنو تاوان ناكەن، جگە لە تاوانە بچوكەكان كە بێگومان پەروەردگارت لێبوردنی فرەوانە.

ئیبنو عەباس دەڵێ: {مَا رَأَيْتُ شَيْئًا أَشْبَهَ بِاللَّمَمِ مِمَّا قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ إِنَّ اللَّهَ كَتَبَ عَلَى ابْنِ آدَمَ حَظَّهُ مِنْ الزِّنَا أَدْرَكَ ذَلِكَ لَا مَحَالَةَ فَزِنَا الْعَيْنِ النَّظَرُ وَزِنَا اللِّسَانِ الْمَنْطِقُ وَالنَّفْسُ تَمَنَّى وَتَشْتَهِي وَالْفَرْجُ يُصَدِّقُ ذَلِكَ كُلَّهُ وَيُكَذِّبُهُ/ متفق عليه/ نەمدیوە هیچ شتێك زیاتر لە لەمەم بچێت، جگە لەوەی كە ئەبوهورەیرە لەپێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی كە: بێگومان خوا لەسەر هەمو بنیامێك بەشی خۆی لە زینا داناوە كەبێگومان پێی دەگات، جا زینای چاو

تەماشاکردنی نامەحرەمەو زینای زمان قسەی نابەجێکردنە لەگەل نامەحرەمداو نەفس ئاواتی خراپە دەخوازێتو ئارەزۆی دەکاتوعەورەتیش یان ئەوانە هەمو دێنێتە دی یان بەدرۆی دەخاتەوە}.

هەر خۆی زاناترە بە ئێوە ئەو کاتەی کە لەم زەویە دروستیکردن و هەر ئەو زاناترە بە ئێوە ئەو کاتەی کە ئێوە کۆرپەلەبون لەناو سکی دایکتاندا، جا کەواتە ئێوە خۆتان پاکانە بۆ خۆتان مەکەن هەر ئەو خۆی زاناترە بەو کەسەی کە لێی دەترسێت، پاداشتی هەمویان بەگوێرەی کرداری خۆیان دەداتەوە چاکە بە چاکەو خراپە بە خراپە.

ئەبوبەکرە دەڵێت: پیاوێك لەلای پێغەمبەردا ﷺ هات بەباسو سەنای پیاوێکی تردا، جا پێغەمبەر فەرموی: {وَيْلَكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ قَطَعْتَ عُنُقَ صَاحِبِكَ مِرَارًا ثُمَّ قَالَ مَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَادِحًا أَخَاهُ لاَ مَحَالَةَ فَلْيَقُلْ أَحْسِبُ فُلَانًا وَاللَّهُ حَسِيبُهُ وَلَا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا أَحْسِبُهُ كَذَا وَكَذَا إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَلِكَ مِنْهُ./متفق عليه/ وای بۆ تۆ ملی رەفیقەکەتت شکاند، ملی هاورێکەتت شکاند، چەند جارێکی فەرموەوە، پاشان فەرموی: هەر کام لەئێوە هەرناچارەو دەیەوێ تاریفی برایەکی خۆی بکات، سابا بڵێت: وا گومانەکەم فلاَن کەس کەخوا وای بۆ حیساب بکات و پاکانەی کەس ناکەم بۆ خوا من ئاواو ئاوای دەزانم ئەگەر شتێکی لێ دەزانی}.

(٣٣) ئایا تۆ ئەو کەسەت بینی کە پشتی لە ئایین کرد.

(٣٤) کەمێك لە ماڵی دەبەخشیو ئیتر دەست دەگرێتەوە لەو بەخشینە، وەکو ئەو کەسەی کە بیرێك هەڵکەنێت، پاشان بگات بە بەردێکی سەختو واز لە بیرەکە بهێنێت. یان کەم دەبەخشێتو زۆر کۆدەکاتەوە.

(٣٥) ئایا ئەو زانیاری شاراوەی لەلایە ئەوسا ئەو بۆ خۆی شت بزانێتو ببینێتو بریاربدات؟ ئەوە بەرپەرچدانەوەی ئەو کەسانەیە کە دەڵێن فلانە کەس شەفاعەتمان بۆ دەکات یان لە قیامەتدا ئەگەر راست بێت ئێمە وەزعمان باش دەبێت.

(٣٦) یان ئایا لەوە ئاگادار نەکراون کە لەناو پەرەکانی موسادا چی نوسراوە.

(٣٧) وە لە پەرەکانی ئەو ئیبراهیمەی کە زۆر نمەکناسو بەوەفابوە؟ کە ئەویش ئەمەیە.

(٣٨) کە هیچ کەسێکی تاوانبار تاوانی کەسێکی تر هەڵناگرێت.

(٣٩) جا بۆ مرۆڤ جگە لەوەی کە کۆششی بۆ بکات شتێکی تری دەست ناکەوێت.

وَأَنَّهُۥ خَلَقَ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰ ﴿٤٥﴾ مِن نُّطۡفَةٍ إِذَا تُمۡنَىٰ ﴿٤٦﴾ وَأَنَّ عَلَيۡهِ ٱلنَّشۡأَةَ ٱلۡأُخۡرَىٰ ﴿٤٧﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ أَغۡنَىٰ وَأَقۡنَىٰ ﴿٤٨﴾ وَأَنَّهُۥ هُوَ رَبُّ ٱلشِّعۡرَىٰ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّهُۥٓ أَهۡلَكَ عَادًا ٱلۡأُولَىٰ ﴿٥٠﴾ وَثَمُودَاْ فَمَآ أَبۡقَىٰ ﴿٥١﴾ وَقَوۡمَ نُوحٖ مِّن قَبۡلُۖ إِنَّهُمۡ كَانُواْ هُمۡ أَظۡلَمَ وَأَطۡغَىٰ ﴿٥٢﴾ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَةَ أَهۡوَىٰ ﴿٥٣﴾ فَغَشَّىٰهَا مَا غَشَّىٰ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكَ تَتَمَارَىٰ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نَذِيرٞ مِّنَ ٱلنُّذُرِ ٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٥٦﴾ أَزِفَتِ ٱلۡأٓزِفَةُ ﴿٥٧﴾ لَيۡسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ كَاشِفَةٌ ﴿٥٨﴾ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ﴿٥٩﴾ وَتَضۡحَكُونَ وَلَا تَبۡكُونَ ﴿٦٠﴾ وَأَنتُمۡ سَٰمِدُونَ ﴿٦١﴾ فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِۤ وَٱعۡبُدُواْ۩ ﴿٦٢﴾

## ٥٤ سُورَةُ القَمَرِ ٥٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقۡتَرَبَتِ ٱلسَّاعَةُ وَٱنشَقَّ ٱلۡقَمَرُ ﴿١﴾ وَإِن يَرَوۡاْ ءَايَةٗ يُعۡرِضُواْ وَيَقُولُواْ سِحۡرٞ مُّسۡتَمِرّٞ ﴿٢﴾ وَكَذَّبُواْ وَٱتَّبَعُوٓاْ أَهۡوَآءَهُمۡۚ وَكُلُّ أَمۡرٖ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣﴾ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مِّنَ ٱلۡأَنۢبَآءِ مَا فِيهِ مُزۡدَجَرٌ ﴿٤﴾ حِكۡمَةُۢ بَٰلِغَةٞۖ فَمَا تُغۡنِ ٱلنُّذُرُ ﴿٥﴾ فَتَوَلَّ عَنۡهُمۡۘ يَوۡمَ يَدۡعُ ٱلدَّاعِ إِلَىٰ شَيۡءٖ نُّكُرٍ ﴿٦﴾

(٤٠) سا بێگومان رەنجو زەحمەتی ئەو دەبینرێتو پاداشتی خۆی دەست دەکەوێت. وتراوە ئەمە بۆ بێباوەڕانەو مرۆڤی باوەڕدار لە چاکەو دوعاو شەفاعەتی دوارۆژ سود بەیکتر دەگەیەنن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ/مسلم وغيره/ هەرکاتێ مرۆڤ مرد کردارەکەی دەبچڕێت مەگەر لەسێ لاوە مەگەر لە چاکەیەکی بەردەوامدا یان زانیارییەك کەپاش خۆی سودی هەبێت یان منالێکی چاکی کە دوعای خێری بۆ بکات} جا ئەوەی کە لەم فەرمودەدا هاتوە لە راستی دا لە هەوڵو تیکۆشانی مردوەکەیە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ أَطْيَبَ مَا أَكَلَ الرَّجُلُ مِنْ كَسْبِهِ وَإِنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسْبِهِ/ النسائي، صحححه الألباني / بێگومان پاکترین خواردن کە پیاو دەیخوات ئەو خواردنەیە کەبە کارو تەلاشی خۆی بەدەستی هێناوەو بێگومان منالەکەی لەکارو تەلاشی خۆیەتی}.

(٤١) بە پاداشتێکی تێرو تەواوتر پاداشتی دەدرێتەوە.

(٤٢) جا بێگومان گەڕانەوەیش هەر بۆ لای پەروەردگارتە.

(٤٣) خۆ بێگومان کە هەر ئەوە شتی وات بۆ دەکات کە پێبکەنیت و هەر ئەویشە دەتگریێنێت. واتە ئەو هۆیانە کە شادمانت بکەنو پێبکەنیت و ئەوەش کە بتگریێنێت هەر بەدەستی ئەوەو کەسی

تر شتی پێ ناكرێت لەو بارەوە ئەگەر ئارەزۆی خودای لەسەر نەبێت.

(٤٤) سا بێگومان هەر خۆیەتی دەمرێنێتو زیندویش دەكاتەوە.

(٤٥) خۆ بێگومان هەر ئەوە كە جووتەكان كە نێرو مێیە دروست دەكات،

(٤٦) لە ئاوێك ئەوكاتەی كە فرێ دەدرێتە ناو ڕەحمەوە. ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەكات ئاوی پیاوە كە نێرو مێ بونی منداڵ دیاری دەكاتو زانستی ئەمڕۆش ئەوەی زانیوە.

(٤٧) جا بێگومان هەر لەسەر خۆیەتی جارێكی تر دروستی بكاتەوە بۆ حیسابو پاداشتو تۆڵە.

(٤٨) خۆ بێگومان كە هەر ئەویشە دەوڵەمەند دەكاتو سەرمایەی زۆریش دەدات.

(٤٩) سا بێگومان ئەو هەر خۆیەتی پەروەردگاری گەلاوێژ،

(٥٠) خۆ بێگومان كە هەر ئەویشە كەعادی یەكەمی لەناوبردوە.

(٥١) جا سەمودیشی لەناوبرد و هیچی نەهێشتەوە لێیانو هەموی تەفروتوناو قڕكردن.

(٥٢) خۆ لەپێشدا گەلی نوحیشی لەناوبرد كە بەڕاستی ئەوان ستەمكارترو سەركەشتر بون لەمانی پاش خۆیان.

(٥٣) ئەوسا ئاواییەكانی گەلی لووتیشی سەروبن كرد.

(٥٤) جا داپۆشی ئەوەی كەبشێ بۆ داپۆشین. لە بەرد بارانو پاشان سزای پاش مەرگیان كەهەر خودا بۆ خۆی دەزانێت چیان پێكرابێت.

(٥٥) سا تۆ ئەی بیسەر بە كام یەكێ لە چاكەكانی پەروەردگارت گومانت هەیە؟

(٥٦) ئەوە ترسێنەرێكە لەریزی ترسێنەرانی پێشوو گومانتان لە ڕاستیو دروستی خۆیو پەیامەكەیدا نەبێت.

(٥٧) ڕۆژی زیندوبونەوە نزیك بویەوە.

(٥٨) بێجگە لە ﷲ كەس ناتوانێت پەردە لەسەرزانینی ئەو كاتە لادادتو كاتی هاتنی بە وردی دیاری بكات،

(٥٩) ئایا ئێوە لەو قسەیەكە قورئانە سەرتان سوڕدەمێنێت،

(٦٠) جا پێدەكەننو گاڵتەی پێدەكەنو ناگرین؟!

(٦١) ئەوسا ئێوە بێ ئاگانو پشت لەو قورئانە دەكەنو بە شتی پڕو پوچیوەك گۆرانیو هەڵپەڕكەو چەپڵەڕێزان خۆتان خەریك دەكەن؟!

(٦٢) دەسا سوجدە ببەن بۆ ﷲ ﷻ ئەو زاتەی كە دروستی كردونو هەر بەندایەتی ئەو بكەنو واز لە بتو شەیتانو شەیتان سیفەتان بهێنن.

## ٥٤ سورەتی قەمەر ٥٥

سورەتی قەمەر یان (إقْتَرَبَت) كە سورەتی پەنجاو چوارەمی قورئانە لە مەكەدا هاتووەتە خوارەوە، وتراوە جگە لە ئایەتی ﴿ سَيُهْزَمُ ٱلْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ... ﴾ بەڵام دایكی باوەڕداران عایشە دەڵێت: {نَزَلَتْ بِمَكَّةَ وَأَنَا جَارِيَةٌ أَلْعَب:﴿ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ ﴾ الْآيَة " . وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سی و حەوتەمەو پاش سورەتی (الطارق) و پێش (ص) دابەزیوە. ئەم سورەتە پەنجاو پێنج ئایەتە.

ئیمامی بوخاری هێناویەتی لە ئەنەسەوە كە خەڵكی مەكە داوایان كرد لە پێغەمبەر ﷺ كە موعجیزەیەكیان پیشان بدات، جا ئەویش هێمای بۆ مانگ كردو كردی بە دوو بەشەوە بینیان كە چیای حیرا كەوتوتە نێوانی ئەو دوو لەتەوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) قیامەت نزیك بۆتەوەو مانگ بو بەدوو لەتەوە،

لە فەرمودەدا هاتوە كە پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: {بُعِثْتُ وَالسَّاعَةُ هَكَذا/متفق علیه/ ڕەوانە كراومو لەگەڵ هاتنی قیامەتدا ئاواین هێمای كرد بە دوو پەنجەی ناوەڕاستو شایەتمان} وە هەروە ها دەفەرموێ: {اقْتَرَبَتِ السَّاعةُ وَلا يَزدَادُ الناسُ على الدُّنيا إلا حِرصاً وَلا يَزدادونَ مِن اللهِ إلا بُعداً /السلسلة الصحيحة/ قیامەت نزیكبویەوە كەچی خەڵكی هەرسورە لەسەر ژیانی دنیاو هەر لەخوا دوردەكەونەوە}

(٢) خۆ هەر بەڵگەیەك دەبینن لەسەر ڕاستیو دروستی ئەم پەیامەو پێغەمبەرمانﷺ پشتی تێدەكەنو دەست بە هەڵبەستنی درۆو قسەی پڕو پوچ دەكەن سەبارەت بەو زاتەو پەیامەكەیو دەڵێن: جادوویەكی بەهێزو بتەوەو بەردەوامە. یان گوێی پێمەدەن جادوویەكەو دەڕواتو نامێنێت.

(٣) وە بە درۆیان خستەوەو دوای ئارەزۆكانی خۆیان كەوتنو هەموو كارێكیش كاتی دیاری خۆی هەیە. یان هەمو كارێك ئارامگرە بە خاوەنەكەی لە بەهەشتدا یان لە دۆزەخ.

(٤) جا بە راستی ئەوەندە هەواڵو دەنگوباسی پێشویان پێگەیشتوەو بیستویانە کە بەس بو بۆ ئەوەی لە تاوانو دژایەتی پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی وازبهێنن.

(٥) کە ئەمە ئەوپەڕی داناییو کار بەجێیەو دەگات بەجێگای مەبەست، بەڵام ئەم ترسێنەرانە سوودیان پێنەدان چونکە بەگوێیان نەکردن.

(٦) سا تۆش گوێیان پێمەدە، ئەو ڕۆژەی کە بانگکەر بانگ دەکات بۆ شتێك کە بەدڵیان نیە، کەزیندوبونەوەو وەرگرتنی نامەی کردارو حەشرو حیسابە، بەڵکو ئاوات دەخوازن کە نە نامەیان پێبدرایەو نە زیندو بونایەوە.

(٧) کزو چاوشۆڕن کە لە گۆڕستان دێنە دەرەوە، بەراستی هەروەکو کوللە وان کەبڵاوبوبێتەوە بەودەشتو دەرەدا ، هەمو مرۆڤ بەرەو زەوی مەحشەر دێن.

(٨) بەپەلە ملیان بەرزدەکەنەوە بەرەو بانگکەرەکە، جا خوانەناسان دەڵێن: ئەمە ڕۆژێکی سەختە.

(٩) پێش ئەوانیش گەلی نوح باوەڕیان نەبو، جا باوەڕیان بە بەندەی ئێمە نەکردو وتیان: شێتەو بەرگریان لێکرد لە بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی.

(١٠) جا ئەویش هانای برد بۆ پەروەردگاریو وتی: بەڕاستی من شکستم خوارد لە هێزو توانادا نەك لە قسەو بەڵگەدا، داوات لێدەکەم تۆڵەم بۆ بستێنە لەو گەلە خوانەناسە، بەڵێ پەروەردگار نزاکەی وەرگرتو فەرمانی سزادانی دان.

(١١) ئەوسا بۆ هاتنە خوارەوەی ئاوێکی زۆرو بە لێزمە دەرگاکانی ئاسمانمان خستە سەرپشتو ئاومان ڕژاندە خوارەوە.

(١٢) چاوگە ئاوەکانی زەویشمان هەڵقوڵاند، ئینجا ئاو گەینە یەك بە گوێرەی ئەوەی کە بڕیاری بۆ درا بو ڕوی زەوی هەموی بو بە دەریا.

(١٣) جا نوح عليه السلام و پەیڕەوانیمان لەسەر کەشتی بە بزمار دروستکراو هەڵگرت.

(١٤) کە لەژێر چاودێری خۆماندا دەڕۆیشتو خوانەناسانمان بەوئاوە بن ئاو کردو لەناومان بردن کە ئەوە تۆڵەیەك بو وەرگیرا بۆ ئەو کەسەی کەسوپاسی نەکرا کە الله یە. واتە خوانەناسان منەتی الله یان نەزانیوپەیڕەوی پێغەمبەرەکەیان نەکرد بۆیە ئاوەها بنئاوکران.

خُشَّعًا أَبۡصَٰرُهُمۡ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ كَأَنَّهُمۡ جَرَادٞ مُّنتَشِرٞ ﴿٧﴾ مُّهۡطِعِينَ إِلَى ٱلدَّاعِۖ يَقُولُ ٱلۡكَٰفِرُونَ هَٰذَا يَوۡمٌ عَسِرٞ ﴿٨﴾ ۞كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ فَكَذَّبُواْ عَبۡدَنَا وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ ﴿٩﴾ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ ﴿١٠﴾ فَفَتَحۡنَآ أَبۡوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٖ مُّنۡهَمِرٖ ﴿١١﴾ وَفَجَّرۡنَا ٱلۡأَرۡضَ عُيُونٗا فَٱلۡتَقَى ٱلۡمَآءُ عَلَىٰٓ أَمۡرٖ قَدۡ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلۡنَٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلۡوَٰحٖ وَدُسُرٖ ﴿١٣﴾ تَجۡرِي بِأَعۡيُنِنَا جَزَآءٗ لِّمَن كَانَ كُفِرَ ﴿١٤﴾ وَلَقَد تَّرَكۡنَٰهَآ ءَايَةٗ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿١٥﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٦﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿١٧﴾ كَذَّبَتۡ عَادٞ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا صَرۡصَرٗا فِي يَوۡمِ نَحۡسٖ مُّسۡتَمِرّٖ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٖ مُّنقَعِرٖ ﴿٢٠﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٢١﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٢٢﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ بِٱلنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوٓاْ أَبَشَرٗا مِّنَّا وَٰحِدٗا نَّتَّبِعُهُۥٓ إِنَّآ إِذٗا لَّفِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَءُلۡقِيَ ٱلذِّكۡرُ عَلَيۡهِ مِنۢ بَيۡنِنَا بَلۡ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٞ ﴿٢٥﴾ سَيَعۡلَمُونَ غَدٗا مَّنِ ٱلۡكَذَّابُ ٱلۡأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرۡسِلُواْ ٱلنَّاقَةِ فِتۡنَةٗ لَّهُمۡ فَٱرۡتَقِبۡهُمۡ وَٱصۡطَبِرۡ ﴿٢٧﴾

(١٥) جا بە راستی ئەو ڕووداوەمان هێشتەوە کە نیشانەیەك بێت بۆ خەڵکی پاش خۆی ئاخۆ کەسێك هەیە بیرلەم ڕوداوە بکاتەوەو سودی لێ وەربگرێت؟

(١٦) دەسا سزاو ترساندنەکانم چۆن بو، هاتەدی یان قسەیەکی نەزۆك بو؟ جا کێ سەرکەوتو کێ لەناوچوو؟

(١٧) خۆ بەراستی ئەم قورئانە ئاسان دەکەین بە شێوەیەك کە هەمو کەسێکی ژیرر دەتوانێت لێی تێبگات، جا ئایا کەسێك هەیە کە بیربکاتەوەو سوود لەم قورئانە وەربگرێت؟ واتە با پەندی لێوەرگرن هەتا دوچاری سەختیو بەڵا نەبوون.

(١٨) گەلی عادیش باوەڕیان نەهێنا بە هود عليه السلام سا چۆن بو سزاو ترساندنی من بۆیان؟

(١٩) بێگومان ئێمە بایەکی دەنگ گەورەی ساردمان بۆ ڕەوانەکردن لە کاتێکی شوومدا بە بەردەوامی لەماوەی حەوت شەوو هەشت ڕۆژدا.

(٢٠) کە خەڵکی لەناو کەندرو چاڵەکانیاندا هەڵدەکەندو دەیکوشتن دەتوت لاسکی داری خورمان هەڵکەندراون بە ڕیشەوە، ئەوەندە باڵابەرزوبەژن درێژبوون.

(٢١) سا بزانە سزاو ترساندنی من چۆن بو بۆیان، سەرکەوتن لەو دژایەتیەدا یان تەفروتونا کرانو لەناوچوون؟

وَنَبِّئۡهُمۡ أَنَّ ٱلۡمَآءَ قِسۡمَةُۢ بَيۡنَهُمۡۖ كُلُّ شِرۡبٖ مُّحۡتَضَرٞ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوۡاْ صَاحِبَهُمۡ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ فَكَيۡفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٠﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ صَيۡحَةٗ وَٰحِدَةٗ فَكَانُواْ كَهَشِيمِ ٱلۡمُحۡتَظِرِ ﴿٣١﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٣٢﴾ كَذَّبَتۡ قَوۡمُ لُوطِۭ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ حَاصِبًا إِلَّآ ءَالَ لُوطٖۖ نَّجَّيۡنَٰهُم بِسَحَرٖ ﴿٣٤﴾ نِّعۡمَةٗ مِّنۡ عِندِنَاۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدۡ أَنذَرَهُم بَطۡشَتَنَا فَتَمَارَوۡاْ بِٱلنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدۡ رَٰوَدُوهُ عَن ضَيۡفِهِۦ فَطَمَسۡنَآ أَعۡيُنَهُمۡ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدۡ صَبَّحَهُم بُكۡرَةً عَذَابٞ مُّسۡتَقِرّٞ ﴿٣٨﴾ فَذُوقُواْ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿٣٩﴾ وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٤٠﴾ وَلَقَدۡ جَآءَ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ ٱلنُّذُرُ ﴿٤١﴾ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا كُلِّهَا فَأَخَذۡنَٰهُمۡ أَخۡذَ عَزِيزٖ مُّقۡتَدِرٍ ﴿٤٢﴾ أَكُفَّارُكُمۡ خَيۡرٞ مِّنۡ أُوْلَٰٓئِكُمۡ أَمۡ لَكُم بَرَآءَةٞ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٤٣﴾ أَمۡ يَقُولُونَ نَحۡنُ جَمِيعٞ مُّنتَصِرٞ ﴿٤٤﴾ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ وَيُوَلُّونَ ٱلدُّبُرَ ﴿٤٥﴾ بَلِ ٱلسَّاعَةُ مَوۡعِدُهُمۡ وَٱلسَّاعَةُ أَدۡهَىٰ وَأَمَرُّ ﴿٤٦﴾ إِنَّ ٱلۡمُجۡرِمِينَ فِي ضَلَٰلٖ وَسُعُرٖ ﴿٤٧﴾ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمۡ ذُوقُواْ مَسَّ سَقَرَ ﴿٤٨﴾ إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴿٤٩﴾

(٢٢) جا بەراستی ئەم قورئانە ئاسان دەکەین بە شێوەیەك کە هەمو کەسێکی ژیریر دەتوانێت لێی تێبگات، جا ئایا کەسێك هەیە کە بیربکاتەوەو سود لەم قورئانە وەربگرێت؟ واتە با پەندی لێوەرگرن هەتا دوچاری سەختیو بەڵا نەبوون.

(٢٣) گەلی سەموودیش باوەڕیان نەکرد بەترسێنەرەکان کە ساڵح ﷺ پێغەمبەریان بو.

(٢٤) جا وتیان: ئایا شوێن تاکە مرۆڤێکی خۆمان بکەوین؟ ئەگەر ئاوەها کارێك بکەین، بێگومان ئێمە لە گومرایی‌و شێتیداین.

(٢٥) ئایا لەناو ئەم هەمو خەڵکەی ئێمەدا فەرمانی خودا بەو دەدرێت؟ نەخێر باوەڕناکەین بەڵکو ئەو درۆزنە لەو قسەیەی کە دەیکاتو خۆبەزلزانە. جا پەروەردگار بەدەمیاندا دەداتەوە ودەفەرموێ:

(٢٦) سبەینێ دەزانن کێ درۆزنو خۆبەزلزانە، واتە پاش مەرگ، بەڵام لەلای خودا ئەوەندەنزیکە بەبەیانی ناوی دەبات.

(٢٧) بێگومان ئێمە ئەو وشترەی کە ئەوان داوایان کرد وەکو موعجیزەیەك لە بەردێك کە خۆیان چاویان لێبو دەرمانهێناو بۆیان ڕەوانە دەکەین تا تاقی کردنەوەیەك بێت بۆیان سا تۆ چاودێریان بەو خۆتبگرە.

(٢٨) جا هەواڵیان پێبدە کە ئەو ئاوەی هەیانە لەناویاندا بەشکراوە، ڕۆژێك بۆ ئەوانو ڕۆژێکیش بۆ وشترەکەیە بەڵام ئەوان لە هەردوو جارەکەدا ئامادەدەبن لەوێ ئەو ڕۆژەی بەشە ئاوی خۆیانە ئەوە هیچو ئەو ڕۆژەیش کە بەشە ئاوی وشترەکەیە ئەوان لەوێ دەبن بۆ دۆشینی وشترەکەو دابەشکردنی شیرەکەی بەسەر خۆیاندا، کەچی بەمەش هەر ڕازی نەبون بەڵکو بیریان لەناوبردنی وشترەکە کردەوەو سەرەنجام بڕیاری لەناو بردنیان دا وەك دەفەرموێ:

(٢٩) جا ئەوان هاوڕێکەی خۆیانیان بانگ کردو ڕایان سپارد بۆ کوشتنی ئەو وشترە، سا ئەویش بە بڕیاری ئەوان دەستیدایە شیرو سەری بڕی!

(٣٠) سا بزانە سزاو ترساندنی من چۆن بو بۆیان، سەرکەوتن لەو دژایەتیەدا یان تەفروتونا کرانو لەناوچون؟

(٣١) بێگومان یەك نەعرەتمان لێدان، ئەوسا هەموویان چەنومل کەوتن وەك داری وردکراوی پەچەکەر چۆن کابرای پەچەکەر دارەکان لەنێوان تێلاکاندا دەچەمێنێتەوە بەم دیو بەو دیوداو ئەوی بێ کەڵکبێ دەکەوێو لەژێرپێی دا ورد دەبێت ئاوایان لێ هات.

(٣٢) جا بەراستی ئەم قورئانە ئاسان دەکەین بە شێوەیەك کە هەمو کەسێکی ژیریر دەتوانێت لێی تێبگات، جا ئایا کەسێك هەیە کە بیر بکاتەوەو سوود لەم قورئانە وەربگرێت؟ واتە با پەندی لێوەرگرن هەتا دوچاری سەختیو بەڵا نەبوون.

(٣٣) گەلی لووتیش باوەڕیان بە ترسێنەران نەکرد کە لووت ﷺ پێغەمبەریان بو، جا خوا دەفەرموێ:

(٣٤) بێگومان ئێمە بەرد بارانمان کردن جگە لە ئالی لووت کە لە پێش ڕۆژبوونەوەدا ڕزگارمان کردن لەو بەڵایە،

(٣٥) ئەمەش چاکەیەك بو لەلایەن ئێمەوە، هەر ئاوەهایش پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە.

(٣٦) بە راستی ترساندنی لە زەبری لێدانی ئێمە کەچی ئەوان گومانیان بوو لە ترسێنەرەکانو باوەڕیان پێ نەکردن.

(٣٧) خۆ بەراستی لەبارەی میوانەکانیەوە زۆر بگرەو بەردەیان لەگەڵدا کرد، جا چاوەکانیانمان لێ سەندنەوە، چونکە دەیانویست کە خراپە لەگەڵ میوانەکانیدا بکەن، جا پێیان وترا: دەسا بچەژن سزای من و تۆڵەی ترساندنەکانم چونکە باوەڕتان نەبوپێی.

(٣٨)سا بەڕاستی لەکاتی بەیانیەکی زوودا سزای بەردەوامیان بۆ هات کە ئەم سزایە بەردەوام بو تا گەیاندنی بە سزای قەبرو پاشان حیسابو پاشان دۆزەخ، جا پێیان وترا:

(٣٩)دەی سا بچەژن سزای منو تۆڵەی گوێ نەدان بە ترساندنەکانم.

(٤٠)جا بەراستی ئەم قورئانە ئاسان دەکەین بە شێوەیەك کە هەمو کەسێکی ژیر دەتوانێت لێی تێبگات، جا ئایا کەسێك هەیە کە بیربکاتەوەو سود لەم قورئانە وەربگرێت؟ واتە با پەندی لێ وەرگرن هەتا دوچاری سەختو بەڵا نەبوون.

(٤١)جا بێگومان کە ترسێنەران هاتنە لای فیرعەونو دەستو دایرەکەی.

(٤٢)کە باوەڕیان نەکرد بە هەمو نیشانەکانی ئێمە، سا ئێمەش لە تۆڵەی ئەو لاساریو خۆبەزلزانیو تاوانانەیاندا گرتنمان بە گرتنی دەسەڵاتدارێکی بە توانای وا کە هیچ شتێکی لە دەست دەرنەچێت، کەبە ئاوی نیل خنکاندنی پاش ڕزگارکردنی موسا‌عليه السلام و پەیڕەوانی، ئینجا ڕو بەکافرانی ئەم ئومەتە دەکاتو دەفەرموێ:

(٤٣)ئایا خوانەناسانی ئێوە چاکترن لەوانە؟ یان ئایا ئێوە لە پەڕاوەکاندا بڕیاری بێ تاوانیتان بۆ هاتوە وا ئەوەندە لە خۆتان بایین؟

(٤٤)یان ئایا ئێوە دەڵێن: کە ئێمە کۆمەڵێکی زۆری یەکدەستو بە تواناینو سەرکەوتوو دەبین بەسەر محمد ﷺ وپەیڕەوانیدا؟ بەڕاستی هیچکام لەوانە نین.

(٤٥)بەم زوانە ئەم کۆمەڵەی ئێوە تێکدەشکێتو پشت تێ دەکەنو ڕادەکەن،

(٤٦) نەك هەر ئەوە بەڵکو قیامەتیش بەڵێنگایانەو بەڕاستی بارودۆخیان لە قیامەت گەورەترو تاڵترە لەم تێکشکانەی دنیایان.

(٤٧)بەبێگومان تاوانباران لە گومڕاییو شێتیدان لە دنیاداو لەناو ئاگری بڵێسەدارو تونددان لە پاشەڕۆژدا،

(٤٨)ئەو ڕۆژەی کە لەسەر دەمو چاویاندا بەناو ئاگردا ڕادەکێشرێن وپێیان دەوترێت: بچەژن ئاگری گەیشتن بە

وَمَآ أَمۡرُنَآ إِلَّا وَٰحِدَةٞ كَلَمۡحِۭ بِٱلۡبَصَرِ ﴿٥٠﴾ وَلَقَدۡ أَهۡلَكۡنَآ أَشۡيَاعَكُمۡ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ﴿٥١﴾ وَكُلُّ شَيۡءٖ فَعَلُوهُ فِي ٱلزُّبُرِ ﴿٥٢﴾ وَكُلُّ صَغِيرٖ وَكَبِيرٖ مُّسۡتَطَرٌ ﴿٥٣﴾ إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّٰتٖ وَنَهَرٖ ﴿٥٤﴾ فِي مَقۡعَدِ صِدۡقٍ عِندَ مَلِيكٖ مُّقۡتَدِرِۭ ﴿٥٥﴾

سُورَةُ الرَّحۡمَٰنِ ٥٥ ٨٧

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلرَّحۡمَٰنُ ﴿١﴾ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ﴿٣﴾ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ﴿٤﴾ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ بِحُسۡبَانٖ ﴿٥﴾ وَٱلنَّجۡمُ وَٱلشَّجَرُ يَسۡجُدَانِ ﴿٦﴾ وَٱلسَّمَآءَ رَفَعَهَا وَوَضَعَ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٧﴾ أَلَّا تَطۡغَوۡاْ فِي ٱلۡمِيزَانِ ﴿٨﴾ وَأَقِيمُواْ ٱلۡوَزۡنَ بِٱلۡقِسۡطِ وَلَا تُخۡسِرُواْ ٱلۡمِيزَانَ ﴿٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ وَضَعَهَا لِلۡأَنَامِ ﴿١٠﴾ فِيهَا فَٰكِهَةٞ وَٱلنَّخۡلُ ذَاتُ ٱلۡأَكۡمَامِ ﴿١١﴾ وَٱلۡحَبُّ ذُو ٱلۡعَصۡفِ وَٱلرَّيۡحَانُ ﴿١٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٣﴾ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِن صَلۡصَٰلٖ كَٱلۡفَخَّارِ ﴿١٤﴾ وَخَلَقَ ٱلۡجَآنَّ مِن مَّارِجٖ مِّن نَّارٖ ﴿١٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٦﴾

سەقەر. لە فەرمودەی سەحیحدا کە ئیمامی بوخاریو نەسائی هێناویانە کە کاتێك ئایەتی ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ ...﴾ دابەزی، عومەر وتی: کام کۆمەڵە دەشکێت؟ کام کۆمەڵە لەناو دەچێت؟ عومەر وتی: کاتێك لەسەر کانیاوەکانی "بەدر" بووینو هەردوو سوپا ڕوبەڕوی یەك وەستابوین پێغەمبەری خوام ﷺ بینی کە لەناو زرێکەی خۆیدا دەجوڵایەوەو دەیفەرمو: ﴿ سَيُهۡزَمُ ٱلۡجَمۡعُ ...﴾ جا ئەو کاتە منیش زانیم مەبەستی ئەم ئایەتە چیە. واتە ئەم ئایەتە پێشتر دابەزیوەو وەعدەی تێکشکاندنی بێباوەڕانی داوە بەڵام هەمو شت کاتێکی دیاری کراوی خۆی هەیە تا ئەوکاتە نەیەت هیچ ناکرێت. وەك دەفەرموێ:

(٤٩)بێگومان ئێمە هەمو شتمان بە ئەندازە دروستکردوە. لە فەرمودەیەکدا کە ئەبو هورەیرە ﷺ هێناویەتی وتویەتی:{جَاءَ مُشْرِكُو قُرَيْشٍ يُخَاصِمُونَ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فِي الْقَدَرِ فَنَزَلَتْ: ﴿ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ ...الى قوله... خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴾ /مسلم وغيره/ بت پەرستەکانی مەکە هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی (قەدەر)ەوە کێشەیان لەگەڵدا کرد جا ئەم دووئایەتە ﴿ يَوۡمَ يُسۡحَبُونَ فِي ٱلنَّارِ ...الى قوله... خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴾ هاتە خوارەوە} . ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٥٠) ئەوسا فەرمانی ئێمە تەنها یەك جارە وەك چاوكلاكردن هەر وتمان ببە: دەبێت.

(٥١) جا بەراستی ئێمە خەڵكانی زۆری وەك ئێوەمان لەناوبردوە، دەی ئایا كەسێك هەیە كە بیر بكاتەوەو لە ڕابردوو پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت؟

(٥٢) خۆ هەر شتێكیان كردبێت هەمووی لەناو پەڕاوەكاندا تۆمار كراوە پێش كردنی لە (لوح المحفوظ)و پاش كردنیشی لە نامەی كردارەكانیاندا

(٥٣) جا هەرچی گەورەو بچوك هەیەلەتاوانو لەكردار هەر هەمووی بە دێڕ نوسراوە بێ زیادو كەم. ئینجا پەروەردگار پاش خراپەكارانو سزایان باسی چاكەكارانو پاداشتیان بە كورتی دەكاتو دەفەرموێ:

(٥٤) بێگومان پارێزكاران لەناو باخچە گەلو روباردان.

(٥٥) لە جێگای بەرێزی پڕ خێروبێردا لەلای پادشای بە دەسەڵاتن كەهەمو داخوازیەكانیان بۆ دێنێتە دی. پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:{الْمُقسِطونَ عِندَ اللهِ عَلَى مَنَابِرَ مِن نُورٍ، عَن يَمِينِ الرَّحمَنِ، وَكِلتَا يَدَيهِ يَمِين، الَّذِينَ يَعدِلُونَ فِي حُكمِهِم وَأهلِيهِم وَمَاوَلُّوا /مسلم وغيره/ دادپەروەران لەلای خودا لەسەر مینبەرەكانی نورن، لەلای دەستی ڕاستی ڕەحمانەوەن، كە هەردوو دەستی هەر ڕاستەو خاوەنی فەرە، ئەو كەسانەن كە لە بڕیاریاندا لەناو خاوخێزانیانداو لەناو ئەو كەسانەی كە سەرپەرشتیان دەكەن دادپەروەرانە ڕەفتار دەكەن} .

| ٨٧ | سورەتی ڕەحمان | ٥٥ |
|---|---|---|

سورەتی ڕەحمان كە سورەتی پەنجاو پێنجهەمی قورئانە، هەشتاو حەوت ئایەتە، لە مەكە هاتووەتە خوارەوە، هەندێك وتویانە لە مەدینە دابەزیوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چل وسێ هەمەو پاش سورەتی (الفرقان) و پێش (فاطر) دابەزیوە. ناسخو مەنسوخیشی تێدا نیە.

بەناوی اللّٰە ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەو خودا زۆر بە بەزەییە كە بەو سۆزو میهرەبانیە فرەوانەی هەمو بونەوەری داپۆشیوەو مرۆڤیش لەسایەی دا حەساوەتەوەو نیعمەتەكانی لەژمارەدا نایەتو گەورەترین نیعمەتی هیدایەتو قورئانە.

(٢) كە ئەم قورئانەی لەڕێگای پێغەمبەرەوە ﷺ بەم ئومەتەی گەیاندوە.

(٣) مرۆڤی درووستكردوە.

(٤) فێری قسەكردنی كردوە كە دەتوانێ بەزمانی شتە ناودەرونیەكانو ئاوات و خواستەكانی خۆی باس بكات.

(٥) خۆرو مانگیش دێنو دەچن بە پێی حیسابێكی دیاریو ڕێكوپێك كە بە هۆی ئەو هاتوچۆیەوە شەوو ڕۆژو جیاوازی كەشو هەوا بەدی دێتو دەتوانن كاتەكانیان بۆدیاری بكەن هەر بە هۆی ئەو حیسابە دیاریو ڕێكوپێكەیە كە دەتوانرێت بزانرێت چ كاتێك خۆرو مانگ لە یەك ئاراستەدا دەبن خۆر گیرانو مانگ گیران ڕودەداتو هەر بەو هاتوچۆی شەوو ڕۆژەیە كە دەگات بەتەواو بونی تاك تاكی گیانلەبەر و پاشان تەواوبونی تەمەنی ئەم جیهانە بەدیاری كردنێكی پێشی لەلایەن خوداوە.

(٦) خۆ گژوگیاو درەختیش بۆ پەروەردگاریان سوجدە دەبەنو تەسلیمی فەرمانەكانی ئەونو بە ئەندازەی گەردیلەیەكیش لە فەرمانی لانادەن.

(٧) ئاسمانی بەرز كردوەتەوەو تەرازویشی داناوە بۆ دادپەروەری، تامرۆڤیش فێری دادپەروەری بكات.

(٨) بۆ ئەوەی كە ئێوەش لە ئەندازە دەرنەچن لە سەنگو كێشانەداو سەر ڕاست بن و لە بڕیارتاندا دادپەروەربن.

(٩) با هەڵسەنگانەكانتان دادپەروەرانە بێتو زیان لە كەس نەدەن لەتەرازوو كێشانەدا.

(١٠) جا ئەم زەویەیشی بۆ مەردوم دانا تا لەسەری بژین.

(١١) كە میوەی زۆری تێدایەو دارخورمای خاوەن شكۆفەیش.

(١٢) دانەی خاوەن كاوو گیای بۆن خۆشیشی تێدایە.

(١٣) دەی سا ئێوە ئەی جنۆكەو مرۆڤ بە كام چاكەی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟ جابر دەڵێت:پێغەمبەر ﷺ هات بۆلای یارەكانیو سورەتی ڕەحمانی لە سەرەتاوە تا كۆتایی بۆ خوێندن، جا ئەوانیش بێدەنگبونو هیچیان نەوت، ئینجا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {لَقَدْ قَرَأْتُهَا عَلَى الْجِنِّ لَيْلَةَ الْجِنِّ فَكَانُوا أَحْسَنَ مَرْدُودًا مِنْكُمْ كُنْتُ كُلَّمَا أَتَيْتُ عَلَى قَوْلِهِ ﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ﴾ قَالُوا لَا بِشَيْءٍ مِنْ نِعَمِكَ رَبَّنَا نُكَذِّبُ فَلَكَ الْحَمْدُ/ الترمذي، حسنه الألباني/ بەراستی شەوی جنۆكە ئەمەم خوێند بەسەر جنۆكە كاندا لەئێوە جوانتر وەڵامیان دایەوە، هەر وەختێ دەچوم بەسەرئەم فەرمودەی خوایە ﴿دەی سا ئێوە ئەی جنۆكەو مرۆڤ بە كام چاكەی پەروەردگارتان باوەڕ ناكەن؟﴾ دەیان وت: بەهیچ

نیعمەتێکی پەروەردگارمان بێباوەڕنین جاهەربۆتۆیە سوپاس} بەم شێوەیە دەردەکەوێت کە پێغەمبەر ﷺ قسەی لەگەل جنۆکەدا کردوەو بانگی کردون بۆ ئایینو قورئانی بۆ خوێندونەتەوە، واتە: پێغەمبەری ئینسانو جنۆکەیە.

﴿١٤﴾ سەرەتا مرۆڤی لە قوڕێکی وشکبوی وای دروستکرد وەك گۆزەی بە ئاگر سورەوەکراو دەستت لێبدایە زرنگەی دەهات.

﴿١٥﴾ وە جنۆکەی لە پوختەی ئاگر دروستکرد. پێغەمبەر ﷺ فەرموی:{خُلِقَتْ الْمَلَائِكَةُ مِنْ نُورٍ وَخُلِقَ الْجَانُّ مِنْ مَارِجٍ مِنْ نَارٍ وَخُلِقَ آدَمُ مِمَّا وُصِفَ لَكُمْ/مسلم وغيره/ فریشتە دروستکراون لەروناکیو جنۆکە دروستکراوە لەپوختەی ئاگرو ئادەمی لەوەی کە بۆتان باسکراوەدروستکراوە} واتە لەخاك دروستکراوە.

﴿١٦﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿١٧﴾ پەروەردگاری دوو ڕۆژهەلاتی هاوینو ڕۆژهەلاتی زستان یان ڕۆژهەلاتی خۆرو ڕۆژهەلاتی مانگو پەروەردگاری دوو ڕۆژئاوایشە. لە قورئاندا وشەی ڕۆژهەلات (المشرق) وە وشەی ڕۆژئاوا (المغرب) بەگوێرەی باسەکان بە شێوەی تاكو جوتو كۆ هاتوە: لە ئایەتی بیستو هەشتی سورەتی شوعەرادا هاتووە:﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ ﴿٢٨﴾﴾ وە لە سورەتی مەعاریجدا بە كۆ هاتون: ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ ﴿٤٠﴾﴾ وە لەم سورەتەدا بە جوت باسکراون: ﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ﴾ کاتێك بە تاك هاتون مەبەست ناحیەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتە، دیارە خۆر هەر ڕۆژێ کە هەلدێت جێگایەکی تایبەتی هەیە لەسالداو ڕۆژئاوایشی هەروەهایە مانگیش هەر ئاوەهایە، جا لەمڕووەوە ڕۆژئاواو ڕۆژهەلهاتەکان زۆرن، وە ئەستێرەکان زۆرن کە ئەوانیش خاوەنی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلاتن، جا لەوێدا کە بە کۆ هاتوە دەگونجێت مەبەست ئەوانە بێت، وە لەم سورەتەدا کە یەك لەدوای یەك باسی جوتەکان دەکات وەك دروستکردنو فێر کردن، خۆرو مانگ، ئاسمانو زەوی، جنۆکەو ئینسان، بەهەشتو دۆزەخ، ژیانومردن...هەتادوای. دەگونجێت دوو ڕۆژهەلاتو دوو ڕۆژئاوا، کە ڕۆژئاواو ورۆژهەلاتی درێژترینو کورترین ڕۆژی سالّ مەبەست بێت، لەراستیدا لەهەمویاندا تواناییو زاناییو دانایی خوادەردەکەوێت.

﴿١٨﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿١٩﴾ دوو دەریای سەربەخۆ کردوەو دەگەن بە یەك.

رَبُّ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ وَرَبُّ ٱلۡمَغۡرِبَيۡنِ ﴿١٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿١٨﴾ مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ يَلۡتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٞ لَّا يَبۡغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخۡرُجُ مِنۡهُمَا ٱللُّؤۡلُؤُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٢٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٣﴾ وَلَهُ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡمُنشَـَٔاتُ فِي ٱلۡبَحۡرِ كَٱلۡأَعۡلَٰمِ ﴿٢٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾ كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ﴿٢٦﴾ وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٢٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٨﴾ يَسۡـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ﴿٢٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٠﴾ سَنَفۡرُغُ لَكُمۡ أَيُّهَ ٱلثَّقَلَانِ ﴿٣١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٢﴾ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴿٣٣﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٤﴾ يُرۡسَلُ عَلَيۡكُمَا شُوَاظٞ مِّن نَّارٖ وَنُحَاسٞ فَلَا تَنتَصِرَانِ ﴿٣٥﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٦﴾ فَإِذَا ٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتۡ وَرۡدَةٗ كَٱلدِّهَانِ ﴿٣٧﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٣٨﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُسۡـَٔلُ عَن ذَنۢبِهِۦٓ إِنسٞ وَلَا جَآنّٞ ﴿٣٩﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٠﴾

﴿٢٠﴾ بەلام لەنێوانیاندا پەردە هەیەو هیچ کامیان زیادەڕەوی ناکات بەسەر ئەویتریاندا تا هەردووکیان خراپ ببن. زانایانی ئەمڕۆی فیزیای دەلێن: بەهۆی هێزێك کە پێی دەوترێت "انشداد السطحي" کە بە هۆی جیاوازی چڕیو خەستی دوو دەریادا دروست دەبێت ئەو دوو دەریایە کاتێك کە بەیەك دەگەن تێکەلاوی یەکتر نابنو تامو ڕەنگی یەکتر ناگۆڕن ئەم حەقیقەتە زانستیە کە ئەمڕۆ زانایان وەك دۆزینەوەیەکی زانستی باسی لێوە دەکەن، کە قورئانی پیرۆز زیاتر لە هەزارو چوارسەد سالّ پێش ئیستا باسی لێکردوە، ئایا دەگونجێت ئەمە قسەی پیاوێکی نەخوێنەوار بێت کە لە هەمو ژیانیدا لە دەریاوە دور بوە؟

﴿٢١﴾دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٢٢﴾ لە هەردووکیان مرواریو مەرجان دەردێت.

﴿٢٣﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٢٤﴾لەبەر هێزو توانایو کاربەجێیی خۆیەتی کە ئەو کەشتیە گەورانەی وەك چیا بەناو ئەو دەریا گەورانەدا دێنو دەڕۆن .

﴿٢٥﴾دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٢٦﴾ ئەوەی کە لەسەر ئەم زەویەدایە هەموی لە ناودەچێ.

يُعۡرَفُ ٱلۡمُجۡرِمُونَ بِسِيمَٰهُمۡ فَيُؤۡخَذُ بِٱلنَّوَٰصِي وَٱلۡأَقۡدَامِ ﴿٤١﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٢﴾ هَٰذِهِۦ جَهَنَّمُ ٱلَّتِي يُكَذِّبُ بِهَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ﴿٤٣﴾ يَطُوفُونَ بَيۡنَهَا وَبَيۡنَ حَمِيمٍ ءَانٖ ﴿٤٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٥﴾ وَلِمَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ جَنَّتَانِ ﴿٤٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٧﴾ ذَوَاتَآ أَفۡنَانٖ ﴿٤٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٤٩﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ تَجۡرِيَانِ ﴿٥٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥١﴾ فِيهِمَا مِن كُلِّ فَٰكِهَةٖ زَوۡجَانِ ﴿٥٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٣﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ فُرُشِۭ بَطَآئِنُهَا مِنۡ إِسۡتَبۡرَقٖۚ وَجَنَى ٱلۡجَنَّتَيۡنِ دَانٖ ﴿٥٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٥﴾ فِيهِنَّ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٞ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنّٞ ﴿٥٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٧﴾ كَأَنَّهُنَّ ٱلۡيَاقُوتُ وَٱلۡمَرۡجَانُ ﴿٥٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٥٩﴾ هَلۡ جَزَآءُ ٱلۡإِحۡسَٰنِ إِلَّا ٱلۡإِحۡسَٰنُ ﴿٦٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦١﴾ وَمِن دُونِهِمَا جَنَّتَانِ ﴿٦٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٣﴾ مُدۡهَآمَّتَانِ ﴿٦٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٥﴾ فِيهِمَا عَيۡنَانِ نَضَّاخَتَانِ ﴿٦٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٧﴾

﴿٢٧﴾ ئەوسا تەنها پەروەردگاری خاوەن شکۆی بەرزو بەڕێزت دەمێنێت .

﴿٢٨﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٢٩﴾ئەوەی لە ئاسمانانو زەویدایە هەموویان داوا لەو دەکەنو بێ ئەو هیچ کارێکیان بۆ ناکرێت، ئەو هەمو ڕۆژێك بە ئیشێکەوە خەریکە. پێغەمبەرﷺ لەبارەی ئەم ئایەتەوە دەفەرموێ:{مِنْ شَأْنِهِ أَنْ يَغْفِرَ ذَنْبًا وَيُفَرِّجَ كَرْبًا وَيَرْفَعَ قَوْمًا وَيَخْفِضَ آخَرِينَ/ ابن ماجه، حسنه الألباني/ وە لەو ئیشانەی پەروەردگار ئەوەیە کە لە تاوانێك خۆشدەبێتو گرفتاریەك لادەباتو گەلێك بەرزدەکاتەوەو هەندێکی تر نزم دەکاتەوە} .

﴿٣٠﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٣١﴾بەم زووانە ڕو لە کارو کردارتان دەکەین ئەی جنۆکەو مرۆڤ، جادەستمان خاڵی دەبێت بۆ حیسابو کیتاب لە گەڵ ئێوەش دا، دیارە اللَّهُ هیچ کات سەرقاڵ نیە تا لە پاشدا دەستی خاڵی ببێت بۆ تۆڵە وەرگرتن لێمان، بەڵکو ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندەو بەگوێرەی عەقڵی خۆمان لەگەڵمان دەدوێت.

﴿٣٢﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٣٣﴾ئەی دەستەی جنۆکەو مرۆڤ ئەگەر دەتوانن بە هەمو گۆشەو بەشەکانی ئاسمانانو زەویدا تێبپەڕن، جا تێپەڕن ناتوانن تێیدا تێبپەڕن مەگەر بە هێزێکی گەورە، وتراوە کاتێك کەجنۆکەو ئینسان کۆ دەکاتەوە، ئینجا پێیان دەوترێت ئەگەر دەتوانن هەڵبێنو خۆتان ڕزگار بکەن وابکەن، ئاشکرایە کە ئەمەتان پێناکرێت مەگەر بە هێزێکی گەورە کە لەو ڕۆژەشدا هیچکەس هیچ هێزو دەسەڵاتێکی لە دەستدا نیە و هەمو هێز هەر بەدەست اللَّهُ ﷻ. جا ئەگەر مەبەست دنیا بێت لێرەدا ئەم ئایەتە مرۆڤ هەڵدەنێت بۆ پەیداکردنی زانیاریو دەسەڵات تا بتوانێت بەم جیهانەدا بگەڕێتو زیاتر ڕێکوپێکی ئەم بوونەوەرەو سوودەکانی بۆ دەرکەوێتو بزانێت کە خالیقی ئەم بوونەوەرە زۆر بە دەسەڵاتو زاناو دانایەو تاکەو هاوبەشی نیەو کەسیش ئەوەی کە ئەو کردویەتی پێی ناکرێت.

﴿٣٤﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٣٥﴾جا ئەگەر بتانەوێت هەڵبێن دادەبارێت بەسەرتاندا گڕی ئاگری تەواوی بێدووکەڵو بە دووکەڵەوە ئەوساش یارمەتی نادرێن بۆ ڕزگاربوونتان،

﴿٣٦﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٣٧﴾ جا ئەو کاتەی کە ئاسمان لەتبو، بو بە گوڵی سورو وەك چەرمی سوری لێهاتو شێوەی ڕۆنی داخکراوی لێنیشت لە سەختیداو توایەوە کە کاتی قیامەتە، جا ئەو کاتە دەزانن چیتان کێلاوە،

﴿٣٨﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٣٩﴾جا لەو ڕۆژەدا نە مرۆڤ و نە جنۆکە پرسیار لە تاوانی ناکرێت، لەو ڕۆژەدا هەمو کەس خۆی بۆخۆی دەزانێت چی کردوەو هەر بە شێوازیش دەناسرێنەوە بۆ مەئموران.

﴿٤٠﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٤١﴾تاوانباران هەر بە سەرو سیمایاندا دەناسرێن، ئەوسا ناوچاوانیان لەگەڵ پێکانیاندا دەگیرێتو بۆ ناو دۆزەخ فڕە دەدرێن،

﴿٤٢﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٤٣﴾ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە تاوانباران باوەڕیان پێی نەبو.

﴿٤٤﴾جا ئەمرۆ لەنێوان ئەو دۆزەخەو لەنێوان ئاوی گەرمی داخدا دەخولێنەوە لەم بۆ ئەوو لەو بۆ ئەم، ئەوەیە سەرئەنجامی تاوانبارانی خوانەناس،

﴿٤٥﴾ دەی سا بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٤٦﴾ ئەوسا هەر کەسێك کە لە دنیادا لە پەروەردگاری خۆی ترسا بێت لە ڕۆژی قیامەتدا دوو باخی بۆهەیە.

پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:{إِنَّ فِي الْجَنَّةِ جَنَّتَيْنِ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا مِنْ فِضَّةٍ وَجَنَّتَيْنِ آنِيَتُهُمَا وَمَا فِيهِمَا مِنْ ذَهَبٍ وَمَا بَيْنَ الْقَوْمِ وَبَيْنَ أَنْ يَنْظُرُوا إِلَى رَبِّهِمْ إِلَّا رِدَاءُ الْكِبْرِيَاءِ عَلَى وَجْهِهِ فِي جَنَّةِ عَدْنٍ /مسلم وغيره/ بێگومان لەناو بەهەشتی گەورەدا دوو باخچە هەیە کەزەرفەکانیو هەرچی تێدا هەیە لەزیوەو دوو باخچەی تر کە زەرفەکانیو هەرچی تێدا هەیە لەزێڕەو لەنێوان ئەو گەلەو لەنێوان ئەوەی کەبڕوانن بۆ پەروەردگاری خۆیان تەنها عەبای گەورایەتیە لە سەر ڕوی ئەوزاتە، لەناو باخچەی هەمیشەیی حەسانەوەدان} .

﴿٤٧﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٤٨﴾هەردوو باخەکە خاوەنی درەختی جرِوپڕو بە پەلكو پۆن،

﴿٤٩﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٥٠﴾لەناو ئەو دوو باخچەدا دوو جۆگەی ئاوی تێدایە کە هەمیشە دەڕوات.

﴿٥١﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٥٢﴾لەناو ئەو دوو باخچەدا هەمو میوەیەکی تێدایەو لفی یەکنو لەیەك دەچن.

﴿٥٣﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٥٤﴾لەسەر ڕایەخ گەلێك کەتانەکانیان لە هەورێشمی ئەستورە پاڵیانداوەتەوەو میوەی گەیشتوی ئەو دوو باخە نزیکە لێیانەوەو بە هەر شێوەیەك بن دەستیان پێی دەگات.

﴿٥٥﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٥٦﴾ جا لەسەر ئەو ڕایەخانە ئافرەتانێکی لەسەرە کە هەر چاویان لە هاوسەرەکەی خۆیانەو کەس لەو بە جوانتر نازانن‌و هەمویان کچن‌و پێش ئەو مێردەی خۆیان نە جنۆکەو نەمرۆڤی تر نزیکیان نەکەوتون.

﴿٥٧﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٥٨﴾ئەو ئافرەتانە ئەوەندە پاكو سپیو جوانن هەر دەڵێی مرواری گەورەو بچوکن.

﴿٥٩﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ لەم بارەوە دەیان فەرموودە هەیە، بەڵام ئێمە لێرەدا یەکێك لەو فەرمودانە دەهێنین کە دەفەرموێ: {إِنَّ أَوَّلَ زُمْرَةٍ تَدْخُلُ الْجَنَّةَ عَلَى

فِيهِمَا فَٰكِهَةٌ وَنَخۡلٌ وَرُمَّانٌ ﴿٦٨﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٦٩﴾ فِيهِنَّ خَيۡرَٰتٌ حِسَانٌ ﴿٧٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧١﴾ حُورٌ مَّقۡصُورَٰتٌ فِي ٱلۡخِيَامِ ﴿٧٢﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٣﴾ لَمۡ يَطۡمِثۡهُنَّ إِنسٌ قَبۡلَهُمۡ وَلَا جَآنٌّ ﴿٧٤﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٥﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ رَفۡرَفٍ خُضۡرٍ وَعَبۡقَرِيٍّ حِسَانٍ ﴿٧٦﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٧٧﴾ تَبَٰرَكَ ٱسۡمُ رَبِّكَ ذِي ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ﴿٧٨﴾

## ٥٦ سُورَةُ الوَاقِعَةِ ٩٦

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١﴾ لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ﴿٢﴾ خَافِضَةٌ رَّافِعَةٌ ﴿٣﴾ إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ﴿٤﴾ وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ﴿٥﴾ فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ﴿٦﴾ وَكُنتُمۡ أَزۡوَٰجٗا ثَلَٰثَةٗ ﴿٧﴾ فَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿٨﴾ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ مَآ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿٩﴾ وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ﴿١٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴿١١﴾ فِي جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿١٢﴾ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَقَلِيلٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٤﴾ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّوۡضُونَةٖ ﴿١٥﴾ مُّتَّكِـِٔينَ عَلَيۡهَا مُتَقَٰبِلِينَ ﴿١٦﴾

صُورَةِ القَمرِ لَيلَةَ البَدرِ، وَالَّتِي تَلِيهَا عَلَى أَضوَإِ كَوكَبٍ دُرِّيٍّ فِي السَّماءِ، لِكُلِّ امرِىءٍ زَوجَتَانِ اثنَانِ، يُرَى مُخّ سُوقِهِما مِن وَرَاءِ اللَّحمِ، وَمَا فِي الجَنَّةِ أَعزَب /مسلم وغيره/ بێگومان یەکەم دەستە کە دەچنە بەهەشتەوە لەسەر وێنەی مانگی چواردەن‌و ئەوەش پاش ئەوان دەچێت لەسەر شێوەی ڕوناکترین ئەستێرەی ئاسمانە، هەر پیاوێکی بەهەشتی دوو هاوسەری هەیە کە مۆخی قاچیان لەژێر گۆشتەوە دیارە، ئەوسا لەناو بەهەشتدا هیچکەس بێ هاوسەر نیە}

﴿٦٠﴾ئایا پاداشتی چاکەو خودا پەرستیو یەکخواپەرستی جگە لە چاکە کە بەهەشتو نازو نیعمەتەکانیەتی شتێکی تر هەیە؟ واتە ئەوان منیان پەرستوەو منیش بەهەشتیان پێدەدەم.

﴿٦١﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٦٢﴾جگە لەو دووانە دوو باخچەی تریش هەن کە پلەیان کەمترە لە دوو باخچەکەی پێشوو.

﴿٦٣﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

﴿٦٤﴾ئەو دوو باخچە ئەوەندە سەوزو تێرئاو و بە ڕەونەقن لە دوورەوە ڕەش دەنوێنن،

﴿٦٥﴾ دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

(٦٦)لەناو ئەو دوو باخچەدا دوو چاوگەی ئاوی تێدایە کە هەڵدەقوڵێن.

(٦٧)دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

(٦٨)لەناوایاندایە میوەی زۆرو دارخورماو هەنار.

(٦٩) دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

(٧٠)لەناو ئەو باخچانەدا ئافرەتانی چاك‌و جوانی تێدایە،

(٧١) دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

(٧٢)ئافرەتانی چاو گەورەو ڕەش هەر لەناو ئەو خێوەتانەدان،

(٧٣) دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟ لە فەرمودەدا کە ئیمامی بوخاری‌و مسلم هێناویانە هاتووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی{إِنَّ فِي الجَنَّةِ خَيمَةً مِن لُؤلُوءَةٍ مُجَوَّفَةٍ عرضُها سِتُّونَ ميلاً (طولُها سِتُّونَ ميلاً.مسلم) فِي كُلِّ زَاوِيَةٍ مِنها أهلٌ مايَرَونَ الاخَرِينَ، يَطُوفُ عَلَيهِمُ المُؤمِنُونَ/ مسلم / بێگومان لەناو بەهەشتدا خێوەتی مرواری ناو بۆشی تێدایە پانایی‌یەکەی شەست میلە (و درێژییەکەشی شەست میلە) لە هەمو گۆشەیەکی ئەو خێوەتەدا خێزانی باوەڕدارانی تێدایە کە ئەوانی تر نایبینن، کە باوەڕداران بەسەریاندا دەسوڕێنەوە} . جا پەروەردگار دەفەرموێ:

(٧٤)کە ئەو ئافرەتانە پێش ئەو هاوسەرەی خۆیان نە مرۆڤ و نە جنۆکە نزیکیان نەکەوتون‌و هەمیشە کچن، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {وَلَوْ اطَّلَعَتْ امْرَأَةٌ مِنْ نِسَاءِ أَهْلِ الْجَنَّةِ إِلَى الْأَرْضِ لَمَلَأَتْ مَا بَيْنَهُمَا رِيحًا وَلَطَابَ مَا بَيْنَهُمَا وَلَنَصِيفُهَا عَلَى رَأْسِهَا خَيْرٌ مِنْ الدُّنْيَا وَمَا فِيهَا /أحمد، صحح الألباني/ ئەگەر ئافرەتێك لە ئافرەتانی خەڵکی بەهەشت بێنە سەر زەوی نێوانی ئاسمان‌وزەوی پڕ دەکەن لە بۆنی خۆش ونێوانیان پاك‌وخۆش دەبێت‌و بەراستی ئەوسەرپۆشەی کەلەسەر سەریەتی چاکترە لەدنیاو لەوەی کە تێیدایە}

(٧٥) دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

(٧٦)شانیان داناوە لەسەر ڕایەخ‌و پاڵپشتی بەرزو بە پارچەی سەوزو نایاب‌و جوان داپۆشراو.

(٧٧) دەی سا ئێوە بە کام چاکەی پەروەردگارتان باوەڕ ناکەن؟

(٧٨)خاوەنی فەڕو چاکەی زۆرە ناوی پەروەردگارت کە خاوەن شکۆو زۆر بەڕێزە. لە فەرمودەدا کە مسلم‌و خاوەنانی سونەت هێناویانە کە پێغەمبەرمان ﷺ پاش سەلامدانەوەی نوێژ هەر بەو ئەندازەی دادەنیشت کەسێ جار(اسْتَغْفِرُاللهِ)ی دەکردو دەیفەرمو:{اللهُمَّ أنتَ السَّلامُ وَمِنكَ السَّلام، تَبَارَكتَ يَاذا الجلالِ وَالإِكرَام/ ئەی خودایە تۆ هەر خۆت سەلامی‌و هەر لەتۆیشەوەیە هێمنی‌و ئاشتی، خاوەنی فەڕوخێری زۆری ئەی خاوەن شکۆو زۆر بەڕێز} .

## سورەتی واقیعە ٥٦ ٩٦

سورەتی واقیعە کە سورەتی پەنجاوشەشەمی قورئانە، نەوەدو شەش ئایەتەو لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، هەندێك دەڵێن جگە لە ئایەتی ﴿ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴾ ﴿ أَفَمِنۡ هَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ تَعۡجَبُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ وە ئایەتی ﴿ ثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٞ مِّنَ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿٤٠﴾ ﴾ ئەم سورەتە ناسخ‌و مەنسوخی تێدا نیە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چل‌وشەشەمەو پاش سورەتی (طه) و پێش (الشعراء) دابەزیوە.

ئەم سورەتە لە گەڵ سورەتی پێشودا کە سورەتی " الرحمن" ـە هەم ماناو تەواوکەری یەکترن کە باس لە هاتنی قیامەت‌و باسی بەهەشت‌و دۆزەخ دەکەن، جا لە سورەتی ڕەحماندا تەنها باس لە لەتبونی ئاسمان دەکات، وەلەم سورەتەدا باس لە جوڵان‌و بومەلەرزەی زەوی دەکات وەك ئەوە وایە کە یەك سورەت بن، ئیبنوعەباس دەڵێت: ئەبوبەکر بەپێغەمبەرﷺ ی وت: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پیربویت، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {شَيَّبَتْنِي هُودٌ وَالْوَاقِعَةُ وَالْمُرْسَلَاتُ وَعَمَّ يَتَسَاءَلُونَ وَإِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ/ الترمذي، صححه الألباني/ واتە پیری کردم سورتی هودو واقیعەو مورسەلات‌و عەمەو تەکویر} چونکە داوای خۆگری و ڕووداوەکانی هاتنی قیامەتیان تێدایە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) هەر کاتێك قیامەت هات.

(٢)هیچکەس ناتوانێت لەو ڕووداوە نکولی بکات‌و هەمو دانی پێدادەنێن بەڵام هیچ سوودێك لەو دان پێدانانەیان وەرناگرن.

(٣) کە ئەو ڕۆژە نزم کەرەوەی خوانەناس‌و ملهوڕو خۆ بەزلزانانەو بەرزکەرەوەی خواناس‌و پارێزکارانە.

(٤) هەرکاتێك زەوی جوڵێنرا بە جوڵاندن.

(٥) وەچیاکان ڕێزاڵ ڕێزاڵ بون.

(٦) ئەوسا بون بە تۆزو بڵاوبوونەوە، لەپاش ئەو کاتەی کە ئەوانە ڕوویانداو خەڵك هەموی مردن‌و پاشان زیندو کرانەوەوخەڵك دادگایی کرا،

(٧) ئێوە لەو کاتەدا بەگوێرەی کردارەکانتان دەکرێن بە سێ بەشەوە، کە بەشەکانیش ئەمانەن:

(٨) ئەوسا بەشێکیان یارانی دەستە ڕاستین، چ پیاوانێکی بەرزو بەڕێزن یارانی دەستە ڕاستی. ئەوانەی کە بە دەستی ڕاستیان نامەی کرداری خۆیان وەردەگرنەوەو بەشانازییەوە هاوار دەکەن: ها وەرن نامەکانمان بخوێننەوە.

(٩) جا بەشێکی تریان یارانی دەستە چەپین چ پیاوانێکی چاوشۆڕو شەرمەندن یارانی دەستە چەپی ئەوانەی کە بە دەستی چەپیان نامەی کرداری خۆیان وەردەگرنەوەو هاواری مردنی هەمیشەیی دەکەن بۆخۆیان.

(١٠) جا بەشی سێهەمیان ئەو کەسانەن پێشکەوتون لەچاکەکاریدا، کەهەمیشە وەپێشدەکەون لەپلەو مەقامدا،

(١١) ئائەوانەن نزیکانی پەروەردگاری خۆیان.

(١٢) لەناو باخچەگەلی نازو نیعمەتدان،

(١٣) ئەوانە کۆمەڵێکن لە گەلانی پێشو،

(١٤) وە کەمێکیش لەوانەی دوایین. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {نَحْنُ الْآخِرُونَ السَّابِقُونَ/ متفق عليه/ ئێمەین کۆتایی‌و پێشکەوتوین} وتراوە: مەبەست لەم ئایەتانە ئومەتی محمدە ﷺ واتە پێشکەوتوان زۆربەیان لەوانن کە لە سەرەتای ئەم ئومەتەوە بوونو کەمێکیشیان لەوانەن کەدواتر دێن کەئەمەش گەورەی‌و بەرزی باوەڕدارانی سەرەتا پیشان دەدات، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {خَيْرُ النَّاسِ قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ /متفق عليه/ باشترینی خەڵك ئەمانەی هاوچەرخی منن، پاشان ئەوانەی کە پاش ئەمانەدێن، پاشان ئەوانەی کە پاش ئەوانەش دێن} ئاشکرایە لەهەمو ئومەتێکدا باوەڕدارانی سەرەتاییان باشترین کەسی ئەو ئومەتە بوون، هەربۆیە دژمنانی ئایین هەمیشە ئەوان بەنیشانە دەگرنو بەنزمکردنەوەی ئەوانەوە شەووڕۆژ خەریك دەبن، خوالەناویانبباتو خەیاڵیان خاوەوتراوە"دەریایش بەدەمی سەگ گڵاونابێ". جا زۆرترینی ئەهلی بەهەشتیش ئومەتی محمدە ﷺ، وەك خوێ دەفەرموێ: {أَهْلُ الْجَنَّةِ عِشْرُونَ وَمِائَةُ صَفٍّ ثَمَانُونَ مِنْهَا أُمَّتِي وَأَرْبَعُونَ سَائِرُ النَّاسِ/أحمد، صححه الألباني / ئەهلی بەهەشت سەدو

يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُّخَلَّدُونَ ﴿١٧﴾ بِأَكْوَابٍ وَأَبَارِيقَ وَكَأْسٍ مِّن مَّعِينٍ ﴿١٨﴾ لَّا يُصَدَّعُونَ عَنْهَا وَلَا يُنزِفُونَ ﴿١٩﴾ وَفَاكِهَةٍ مِّمَّا يَتَخَيَّرُونَ ﴿٢٠﴾ وَلَحْمِ طَيْرٍ مِّمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٢١﴾ وَحُورٌ عِينٌ ﴿٢٢﴾ كَأَمْثَالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ ﴿٢٣﴾ جَزَاءً بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٢٤﴾ لَا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا تَأْثِيمًا ﴿٢٥﴾ إِلَّا قِيلًا سَلَامًا سَلَامًا ﴿٢٦﴾ وَأَصْحَابُ الْيَمِينِ مَا أَصْحَابُ الْيَمِينِ ﴿٢٧﴾ فِي سِدْرٍ مَّخْضُودٍ ﴿٢٨﴾ وَطَلْحٍ مَّنضُودٍ ﴿٢٩﴾ وَظِلٍّ مَّمْدُودٍ ﴿٣٠﴾ وَمَاءٍ مَّسْكُوبٍ ﴿٣١﴾ وَفَاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ ﴿٣٢﴾ لَّا مَقْطُوعَةٍ وَلَا مَمْنُوعَةٍ ﴿٣٣﴾ وَفُرُشٍ مَّرْفُوعَةٍ ﴿٣٤﴾ إِنَّا أَنشَأْنَاهُنَّ إِنشَاءً ﴿٣٥﴾ فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَارًا ﴿٣٦﴾ عُرُبًا أَتْرَابًا ﴿٣٧﴾ لِّأَصْحَابِ الْيَمِينِ ﴿٣٨﴾ ثُلَّةٌ مِّنَ الْأَوَّلِينَ ﴿٣٩﴾ وَثُلَّةٌ مِّنَ الْآخِرِينَ ﴿٤٠﴾ وَأَصْحَابُ الشِّمَالِ مَا أَصْحَابُ الشِّمَالِ ﴿٤١﴾ فِي سَمُومٍ وَحَمِيمٍ ﴿٤٢﴾ وَظِلٍّ مِّن يَحْمُومٍ ﴿٤٣﴾ لَّا بَارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ ﴿٤٤﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا قَبْلَ ذَٰلِكَ مُتْرَفِينَ ﴿٤٥﴾ وَكَانُوا يُصِرُّونَ عَلَى الْحِنثِ الْعَظِيمِ ﴿٤٦﴾ وَكَانُوا يَقُولُونَ أَئِذَا مِتْنَا وَكُنَّا تُرَابًا وَعِظَامًا أَإِنَّا لَمَبْعُوثُونَ ﴿٤٧﴾ أَوَآبَاؤُنَا الْأَوَّلُونَ ﴿٤٨﴾ قُلْ إِنَّ الْأَوَّلِينَ وَالْآخِرِينَ ﴿٤٩﴾ لَمَجْمُوعُونَ إِلَىٰ مِيقَاتِ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿٥٠﴾

بیست ریزە کە هەشتا ریزی ئومەتی منەو چلەکەیشی خەڵکی ترە}.

(١٥) لەسەر تەختگەلێکی چنراو لە زێڕن.

(١٦) شانیان داناوە لەسەریان کە ڕوبەڕوی یەکترن.

(١٧) مندالانی هەمیشە منداڵ هەمیشە هاتوچۆ دەکەن بەناویانداو خزمەتیان دەکەن.

(١٨) بە گۆزەیانی بێ دەستو لولەو مەسینەگەلو پەرداخی پڕ لە شەرابەوە،

(١٩) کە دەیخۆنەوە نە سەریان لێ تێکدەداتو نە لەخۆدەچن.

(٢٠) جا دەگەڕێن بەناویاندا بەمیوەی زۆر لەوەی کە خۆیان هەڵی دەبژێرن.

(٢١) ئەوسا گۆشتی باڵندەش لەوانەی کە ئارەزۆی دەکەن.

(٢٢) جا لەوێدا بۆیان هەیە کچانی سپی‌و چاوڕەش.

(٢٣) هەروەك مرواری تازەی شاراوە کە تۆز لێی نەدابن و دەستی کەسیشیان لێ نەکەوتبێت.

(٢٤) ئەمانە هەموی لە پاداشتی ئەو کردارە چاکانەی کە لە دنیادا کردویانە.

ثُمَّ إِنَّكُمْ أَيُّهَا ٱلضَّآلُّونَ ٱلْمُكَذِّبُونَ ﴿٥١﴾ لَءَاكِلُونَ مِن شَجَرٍ مِّن زَقُّومٍ ﴿٥٢﴾ فَمَالِـُٔونَ مِنْهَا ٱلْبُطُونَ ﴿٥٣﴾ فَشَٰرِبُونَ عَلَيْهِ مِنَ ٱلْحَمِيمِ ﴿٥٤﴾ فَشَٰرِبُونَ شُرْبَ ٱلْهِيمِ ﴿٥٥﴾ هَٰذَا نُزُلُهُمْ يَوْمَ ٱلدِّينِ ﴿٥٦﴾ نَحْنُ خَلَقْنَٰكُمْ فَلَوْلَا تُصَدِّقُونَ ﴿٥٧﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تُمْنُونَ ﴿٥٨﴾ ءَأَنتُمْ تَخْلُقُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلْخَٰلِقُونَ ﴿٥٩﴾ نَحْنُ قَدَّرْنَا بَيْنَكُمُ ٱلْمَوْتَ وَمَا نَحْنُ بِمَسْبُوقِينَ ﴿٦٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ أَمْثَٰلَكُمْ وَنُنشِئَكُمْ فِى مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦١﴾ وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ ٱلنَّشْأَةَ ٱلْأُولَىٰ فَلَوْلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾ أَفَرَءَيْتُم مَّا تَحْرُثُونَ ﴿٦٣﴾ ءَأَنتُمْ تَزْرَعُونَهُۥٓ أَمْ نَحْنُ ٱلزَّٰرِعُونَ ﴿٦٤﴾ لَوْ نَشَآءُ لَجَعَلْنَٰهُ حُطَٰمًا فَظَلْتُمْ تَفَكَّهُونَ ﴿٦٥﴾ إِنَّا لَمُغْرَمُونَ ﴿٦٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٦٧﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلْمَآءَ ٱلَّذِى تَشْرَبُونَ ﴿٦٨﴾ ءَأَنتُمْ أَنزَلْتُمُوهُ مِنَ ٱلْمُزْنِ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنزِلُونَ ﴿٦٩﴾ لَوْ نَشَآءُ جَعَلْنَٰهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ ﴿٧٠﴾ أَفَرَءَيْتُمُ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى تُورُونَ ﴿٧١﴾ ءَأَنتُمْ أَنشَأْتُمْ شَجَرَتَهَآ أَمْ نَحْنُ ٱلْمُنشِـُٔونَ ﴿٧٢﴾ نَحْنُ جَعَلْنَٰهَا تَذْكِرَةً وَمَتَٰعًا لِّلْمُقْوِينَ ﴿٧٣﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٧٤﴾ ۞ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَوَٰقِعِ ٱلنُّجُومِ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهُۥ لَقَسَمٌ لَّوْ تَعْلَمُونَ عَظِيمٌ ﴿٧٦﴾

(٢٥) نە هیچ قسەیەکی پڕوپوچو هەرزەیانە دەبیستن‌و نە گوناھ و تاوانێك.

(٢٦) تەنها هەر سەلام کردنەو قسەی بە کەڵك‌و بێ زیانە، جا بۆ بەشی سێیەمیش دەفەرموێ:

(٢٧) جا یارانی دەستە ڕاست چ پیاوانێکی بەرزو بەڕێزن پیاوانی دەستە ڕاست،

(٢٨) لەناو باخی کەناری بێدڕکدان. عامر دەڵێت: پیاوێکی ئەعرابی هاتە خزمەتی پێغەمبەرو ﷺ وتی: ئەی پێغەمبەرﷺ خوا باس لە درەختێك دەکات لە بەهەشتدا کە ئەو درەختە بە هۆی دڕکەکانی ئێش‌و ئازار دروست دەکات؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: ئەوە کامەیە؟ وتی: داری کەنار پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {أَلَيسَ اللهُ يَقُولُ: ﴿ فِي سِدۡرٖ مَّخۡضُودٖ ﴾ خضد اللهُ شوكه فَجَعَلَ مَكَانَ كُلِّ شَوكَةٍ ثَمَرَةً فإنَّها لَتَنبُتُ ثَمَرًا تُفَتَّقُ الثَّمَرَةُ مِنهَا عَن اثنين وَسَبعين لَونًا مِن طَعَامٍ مَا فيها لَونٌ يَشبَهُ الآخَرَ / ابن أبي الدنيا، الألباني: صحيح لغيره / ئەی ﷻ نافەرموێ: ﴿لەناوباخی کەناری بێدڕکدان؟﴾ﷻدڕکەکانی لێ لابردوە جا لە جێگای هەردڕکێکدا میوەیەکی لێ رواندوە، ئەوسا میوەیەك سەوز دەکات کە دانەیەکی لێ لەت دەکرێت حەفتاودوو ڕەنگ لەخواردنی تێدایە هیچ ڕەنگێکی تێدانیە کەلەوی تر بچێت}

(٢٩) سا لەناو باخچەی مۆزی لەسەر یەك سەفتەکراودان.

(٣٠) جا لەژێر سێبەری پان‌و پۆڕو درێژدان. ئیمامی بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە هێناویەتی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{إنَّ في الجَنَّةِ شَجَرَةً يَسيرُ الرَّاكِبُ في ظِلِّها مِأةَ عَامٍ لايَقطَعُها، إقرَؤا إن شِئتُم ﴿ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴾/ بێگومان لەناو بەهەشتدا درەختێ وا هەیە کە سەد ساڵ سوار لەژێریدا بڕوات هێشتا لەژێرسێبەری دەرناچێت، ئەگەر ئارەزۆتان لێی هەیە با ئایەتی﴿ وَظِلّٖ مَّمۡدُودٖ ﴾ /سێبەری درێژ/ بخوێننەوە} .

(٣١) خۆ تێیدایە ئاوی هەمیشە ڕۆیشتویش.

(٣٢) سا تێدایە میوەی زۆری جۆراو جۆر.

(٣٣) نە دوایی دێت‌و نە قەدەغە دەکرێت. پێغەمبەرمان ﷺ جارێکیان لە نوێژدا جموجۆڵێکی کرد پاشان یارەکانی ئەو جموجۆڵەیان لێ پرسی فەرموی:{إنِّي أُرِيتُ الجَنَّةَ فَتَناوَلْتُ مِنها عُنقُودًا وَلَوْ أَخَذْتُهُ لأَكَلْتُمْ مِنْهُ مَا بَقِيَتِ الدُّنْيا/متفق عليه/ بێگومان بەهەشتم بینی‌و دەستم برد بۆ هێشویەك، جا ئەگەر بمهێنایە بەستان بو هەتا دنیا هەیە} .

(٣٤) جا فەرش‌و ڕایەخگەلی نەرم‌وبەرز یان ئافرەتانی باڵا بەرز. لەراستیدا هەردووکیانی تێدایە.

(٣٥) بێگومان ئێمە لەوێدا ئافرەتانێکمان سەرلەنوێ دروستکرد چۆن دروستکردنێك.

(٣٦) ئەوسا بڕیارماندا کە ئەوانە هەمیشە کچبن. هەرچەند جار کەمێردەکانیان دەچنە لایان دەبنەوە بەکچ‌و بێ ئازارن.

(٣٧) ئەوان مێردی خۆیان خۆش دەوێت‌و هاوسن‌و ساڵی یەکترن. پێغەمبەرمان ﷺ باس لە تەمەنی ئەهلی بەهەشت دەکات‌و دەفەرموێ:{يَدْخُلُ أَهْلُ الجَنَّةِ الجَنَّةَ جُرْدًا مُرْدًا كأنَّهُم مُكَحَّلُونَ أَبْنَاءُ ثَلاثٍ وَثَلاثِينَ سَنَةً/ الترمذي، صححه الألباني/ بەهەشتیان دەچنە بەهەشتەوە لەحاڵێکدا بێ توك‌و بێ‌سمێڵ‌و ڕیش‌و چاو ڕەشن، وەك ئەوەی کە چاویان ڕەشتبێ کە کوڕانی سی‌وسێ ساڵەن} ئەم هەمو نیعمەتە بەرزو بەنرخە بۆ کێ؟

(٣٨) بۆ یارانی دەستە ڕاستین.

(٣٩) کەتاقمێکی گەلانی پێشون. تاقمێکی گەلانی دواین واتە بەشێکی ئەوانە هی ئوممەتانی پێش ئێمەیەو بەشەکەی تریان لەم ئوممەتەی ئێمەیە، ولله الحمد.

(٤١) جا یارانی دەستە چەپی چ خراپ کەسانێکن یارانی دەستە چەپی، ئەمانە:

(٤٢) لەناوی گڕە بای زۆر گەرمو خواردنەوەی ئاوی داخدان.

(٤٣) وە لەژێر سێبەری چڕە دووکەڵی گەرمدان.

(٤٤) نە فێنکی تێدایەو نە هەناسەیەکی ئارامی تێدا دەدەن.

(٤٥) چونکە ئەوانە لەپێشدا ئەهلی سەیرو سەفاو خۆشگوزەرانی بوون.

(٤٦) جا ئەوان سوربون لەسەر گوناهی گەورە کە هاوبەش دانان بۆ پەروەردگارو نەناسینی ئەو زاتە گەورەیە بو.

(٤٧) خۆ ئەوان دەیان وت: ئایا ئێمە کاتێ کەمردینو بوین بە خاكو بە ئێسکەڕزاو تازە ئایا زیندو دەکرێینەوە؟

(٤٨) ئایا ئەو زیندو کردنەوە بۆ ئێمە هەیە بۆ باو باپیرانیشمان دەبێو ئەوانیش هەر زیندو دەکرێنەوە؟!

(٤٩) بڵێ: بێگومان ئەوانەی کە لە پێشدا بوونو ئەوانەیش کە لەپاشدا هاتون.

(٥٠) بەدڵنیاییەوە هەمویان کۆ دەکرێنەوە بۆ کاتی ڕۆژی زانراو کە ڕۆژی قیامەتو حیسابە،

(٥١) پاشان بێگومان ئێوە ئەی ڕێ لێگومبوانی خوانەناس پاش زیندو کردنەوەتانو پاش حیسابو فەرمانتان بۆ ناو ئاگری دۆزەخ.

(٥٢) بێگومان دەبێ لە بەری داری ژەقنەموت بخۆن کەتاڵترینو بۆن ناخۆشترین درەختە . پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە دەفەرموێ: {لَوْ أَنَّ قَطْرَةً مِنَ الزَّقُّومِ قُطِرَتْ فِي دَارِ الدُّنْيَا لَأَفْسَدَتْ عَلَى أَهْلِ الدُّنْيَا مَعَايِشَهُمْ فَكَيْفَ بِمَنْ يَكُونُ طَعَامَهُ/ الترمذي، صححه الألباني/ بێگومان ئەگەر یەك تکە لەئاوی ئەو ژەقنەموتە بتکێتە ئەم دنیایە ژیانی خەڵکی ئەم دنیایە خراپ دەکات، سا دەبێ ژیانی ئەو کەسە چۆن بێت کە ئەمە خواردنی بێت؟!}

(٥٣) جا سکی خۆیانی لێ پڕ دەکەن.

(٥٤) ئەوسا بەسەریدا ئاوی داخ دەخۆنەوە.

(٥٥) جا هەر دەخۆنەوەو دەخۆنەوە بەڵام هەر تینوەتیان ناشکێت، وەك ئەو وشترەی کەدوچاری نەخۆشی تێرئاونەبون دەبێت.

(٥٦) ئەمەیە سەرەتای پێشوازی لێکردنیان بۆ میوانداری! ئاخۆدەبێ لەپاشدا چییان لێ بکرێت؟

(٥٧) ئێمە ئێوەمان دروستکردوە دەی بۆدەبێ باوەڕ نەکەن بە زیندوبونەوە.

(٥٨) ئایا ئێوە ئاوی شەهوەتتان بینیوە ئەوکاتەی کە دەیرژێنن؟

(٥٩) ئایا ئێوە ئەو شەهوەتە دروست دەکەن یان ئێمەین دروستی دەکەین؟ بۆ بیر لە دروستبونی خۆتان ناکەنەوە تا لە دووبارە زیندوبونەوەتان گومانتان نەمێنێت؟

(٦٠) ئێمە مردنمان داناوە بۆتانو ئێمە بەپاش نادرێینو کەس ناتوانێت دەست بخاتە ناو کاروبارمانەوە.

(٦١) لەسەر ئەوەی کە ئەگەر ئێوە بگۆڕینەوە بە وێنە گەلێکی وەکو خۆتانو سەر لەنوێ دروستتان بکەینەوە لە شێوەیەکدا کەخۆتان نازانن.

(٦٢) جا بە ڕاستی خۆتان دەزانن بە دروستبونی یەکەمتان، سا ئیتر دەبوایە بیر بکەنەوە؟

(٦٣) ئایا دەبینن ئەوەی کە زەوی بۆدەکێڵن؟

(٦٤) ئایا ئێوە سەوزی دەکەن یان ئێمەین سەوزی دەکەین؟

(٦٥) ئەگەر ئارەزۆمان لێ بێت هەموی وشك دەکەین خۆ ئیتر ئێوە لەو ڕووداوە سەختە کتوپڕیە سەرتان سوڕدەمێنێت،

(٦٦) ئەوسا دەڵێن بەڕاستی ئێمە زیانمان لێ کەوت،

(٦٧) بەڵکو ئێمە بێ بەشکراین.

(٦٨) ئایا دەبینن ئەو ئاوەی کە دەیخۆنەوە؟

(٦٩) ئایا ئێوە لە هەورەکانەوە ڕەوانەی دەکەن یان ئێمەین دەیبارێنین؟

(٧٠) ئەگەر ئارەزۆمان لێبێت دەیکەین بە ئاوێکی تاڵ کە کەس نەتوانێت بیخواتەوە، دەی حەق وابو ئێوە سوپاسگوزاربن.

(٧١) ئایا دەبینن ئەو ئاگرەی کە خۆتان هەڵیدەگیرێنن؟

(٧٢) ئایا ئێوە درەختی ئەو ئاگرەتان دروستکردوە یان ئێمە دروستکاری ئەو درەختەین؟درەختێکی تەڕوپەلکی خۆی لەیەك دەدەیت ئاگردەکاتەوە.

(٧٣) ئێمە ئەو درەختەمان کردوە بە بیرەوەری ئاگری دۆزەخو سود لێوەرگرتن بۆ ڕێبواران و دانیشتوانیش چاکتر. پێغەمبەرمان

إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴿٧٧﴾ فِي كِتَٰبٖ مَّكۡنُونٖ ﴿٧٨﴾ لَّا يَمَسُّهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُطَهَّرُونَ ﴿٧٩﴾ تَنزِيلٞ مِّن رَّبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ أَفَبِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَنتُم مُّدۡهِنُونَ ﴿٨١﴾ وَتَجۡعَلُونَ رِزۡقَكُمۡ أَنَّكُمۡ تُكَذِّبُونَ ﴿٨٢﴾ فَلَوۡلَآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلۡحُلۡقُومَ ﴿٨٣﴾ وَأَنتُمۡ حِينَئِذٖ تَنظُرُونَ ﴿٨٤﴾ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنكُمۡ وَلَٰكِن لَّا تُبۡصِرُونَ ﴿٨٥﴾ فَلَوۡلَآ إِن كُنتُمۡ غَيۡرَ مَدِينِينَ ﴿٨٦﴾ تَرۡجِعُونَهَآ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ﴿٨٧﴾ فَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُقَرَّبِينَ ﴿٨٨﴾ فَرَوۡحٞ وَرَيۡحَانٞ وَجَنَّتُ نَعِيمٖ ﴿٨٩﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩٠﴾ فَسَلَٰمٞ لَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡيَمِينِ ﴿٩١﴾ وَأَمَّآ إِن كَانَ مِنَ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٩٢﴾ فَنُزُلٞ مِّنۡ حَمِيمٖ ﴿٩٣﴾ وَتَصۡلِيَةُ جَحِيمٍ ﴿٩٤﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ حَقُّ ٱلۡيَقِينِ ﴿٩٥﴾ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٩٦﴾

## ٥٧ سُورَةُ الحَدِيدِ ٢٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢﴾ هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ وَٱلظَّٰهِرُ وَٱلۡبَاطِنُۖ وَهُوَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٣﴾

ﷺ لەبارەی ئەم ئاگری دنیامانەدا کەئاسنی پێدەتاوێنینەوە دەفەرموێ: {نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تُوقِدُونَ جُزْءٌ وَاحِدٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ قَالُوا وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا/ الترمذي، صححه الألباني/ ئەم ئاگرەتان کەئێوە هەڵیدەگیرسێنن یەك بەشە لەحەفتا بەشی گەرمایی دۆزەخ، وتیان: بەخوا هەر ئەمەش بێت بەسە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: جا بەراستی ئەو شەستو نۆ پلەی بەسەرئەمدا زیادە کە هەریەکیان گەرماکەی وەك ئەمە} وتراوە لەناو نیوەدوورگەی عەرەبدا دوو درەخت هەیە کە یەکێکیان ناوی (مەرخە)و ئەوی تریان ناوی (عەفار)ە ئەگەر دوو لقی لە یەك بدەیت ئاگر دەکاتەوە، جا داری تەڕو ئاگری سوتێنەر پەروەردگار لەناو یەکدا کۆی کردوەتەوە (سبحان الله، لە هێزو دەسەڵاتت ئەی پەروەردگار). جا هەر دوا بەدوای ئەوەدا دەفەرموێ:

﴿٧٤﴾ سا بەرزو بەڕێزی بگرە ناوی پەروەردگاری گەورەت.

﴿٧٥﴾ جا سوێند بەو جێگایانەی کە ئەستێرەکانی لێ هەڵدێتو لێی ئاوا دەبن. ئەمەسوێندی خوایە کەگەورەیی دەسەڵاتی خۆی پیشان دەدات، بۆکەسیتر نیە سوێند بە جگە لە خوابخوات، وریابە قیاسی خەڵك نەکەیتە سەرخوا.

﴿٧٦﴾ جا بێگومان ئەگەر بزانن ئەوە سوێندێکی گەورەیە.

﴿٧٧﴾ بێگومان ئەوە قورئانێکی بەڕێزە.

﴿٧٨﴾ لەناوپەڕاوێکی پارێزراو شاراوەیە کە لەوحولمەحفوزە.

﴿٧٩﴾ کەبێجگە لە فریشتەکان هیچ کەسێکی تر لێی نزیك نەبوەتەوە. واتە بێباوەڕان درۆ دەکەن کە دەڵێن: ئەم قورئانە جادوە یان قسەی پڕوپوچی کۆنە یان شەیتانەکان بەگوێیدا دەچپێنن،وانیە بەڵکو ئەم قورئانە،

﴿٨٠﴾ ڕەوانەکراوێکە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە.

﴿٨١﴾ دەی ئایا ئێوە بەم قورئانە گاڵتە دەکەن.

﴿٨٢﴾ جا ئێوە باران کە سەرچاوەی ڕۆزیتانە وا دایدەنێن کە بەهۆی برجی فلانی یان ئەستێرەی فلانی باریوەو دەیکەن بە هاوبەشی خودا بێگومان کە ئێوە بێباوەڕن ئەگینا شتی وا ناکەن، واتە بەهۆی ئەو نیعمەتەی کە پێمان دان پێویستبو سوپاسی پەروەردگار بکەن، کەچی ئێوە ئەو نیعمەتانەتان کرد بە هۆیەك بۆ نا سوپاسی ئەو زاتە. لەم بارەوە پێغەمبەرمان ﷺ شەوێك لە حودەیبیە بون کە باران باری بو فەرموی: دەزانن پەروەردگارتان چی فەرموە؟ وتیان: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرموی: {قالَ أصبَحَ مِن عِبَادي مُؤمِنٌ بِي وَ كَافِرٌ، فَأمَّا مَن قَالَ: مُطِرنَا بِفَضلِ اللهِ وَرَحمَتِهِ فَذَلِكَ مُؤمِنٌ بِي كَافِرٌ بِالكَوَاكِب. وَأمَّا مَن قَالَ: مُطِرنَا بِنوءِ كَذا وَكَذا كَافِرٌ بِي مُؤمِنٌ بِالكَوَاكِب/ متفق عليه/ فەرموی: ئەم بەیانیە هەندێك لە بەندەکانم باوەڕیان بە من هێناو هەندێکیش بێباوەڕبون. جا ئەوانەی کە وتیان: بەهۆی خێرو چاکەی خوداوە بارانمان بۆ باری ئەوانە باوەڕیان بە من هێناو کافربون بە ئەستێرەکان، وە ئەوانەی کەوتیان: بەهۆی ئەستێرەی فلانیو فلانیەوە بارانمان بۆ باری ئەوانە کافر بون بە منو باوەڕیان هێنا بە ئەستێرەکان} .

﴿٨٣﴾ جا با ئەو کاتەی کە گیان دەگات بە قورقوڕاگەو بەشان هەناسە دەداتو کاتی گیان دەرچونی نزیك بووەتەوە.

﴿٨٤﴾ خۆ ئێوە لەو کاتەدا تەماشا دەکەنو لە چواردەوری کۆبونەتەوەو ناڕەحەتن بۆی.

﴿٨٥﴾ لە حاڵێکدا کە ئێمە لەو نزیکترین تا ئێوە، بەڵام ئێوەنابینن،

﴿٨٦﴾ سا ئەگەر پێتان وایە کە پرسینەوەو پاداشتو سزایەك نیە بۆتان،

﴿٨٧﴾ ئەگەر ڕاست دەکەن ئەو گیانە بگەڕێنەوە بۆ ئەو لەشە، چونکە ئێمە بۆ پرسینەوەی دەبەین، ئاشکرایە کە کەس ئەوەی

پێناکرێت دەی تا کەی ئەوەندە گێلو گەمژەنو باوەڕ بە زیندوبونەوەو پاداشتو سزا ناکەن؟ ئینجا پەروەردگار دەمانباتەوە بۆ سەرەتای سورەتەکەو هەروەکو لەوێ مرۆڤی کرد بە سێ بەشەوە لێرەش دووبارە بە سێ بەش کۆتایی بە سورەتەکە دەهێنێتو دەفەرموێ:

(٨٨) ئەوسا ئەگەر ئەو کەسەی کە گیانی دەرچو لەوانە بێت کە نزیکن لە خواوە،

(٨٩) ئەوە ئیسراحەتەولەناو بۆنی خۆشو باخچەی نازو نیعمەت و لە کەیف و سەفادایە .

(٩٠) جا ئەگەر لە یارانی دەستە ڕاستیش بن،

(٩١) ئەو کاتەی کە خەریکە گیان دەردەچێت فریشتەکان دێنە لایو سەلامی لێدەکەنو دەڵێن: مەترسەو خەمگین مەبە ئەم سەلامەیش هی فریشتە دەستە ڕاستەکانن کە نوسەری چاکەی بەندەکانن.

(٩٢) خۆ ئەگەر ئەو کەسەی کە گیانی دەردەچێت لەو خوانەناسو گومڕایانە بێت.

(٩٣) ئەوە میوانداری دەکرێت بە ئاوی داخ،

(٩٤) ئەوسا فڕە دەدرێتە دۆزەخەوە. جا ئیتر ئاگر لە هەر چوارلایەوە دەیسوتێنێتو هیچ دەرفەتێکی نیە چ خۆبگرێت یان خۆنەگرێت هەر ئەوەیە جێگای.

(٩٥) بێگومان ئەم باسە هەرخۆی ڕاستیەکی دان پێدانراوە.

(٩٦) سا پاکی ڕابگرەو یادی بکەو بە ناوی پەروەردگاری گەورەتەوە دەست بەکاربە بۆ گەیاندنی پەیامەکەتو وشەی سبحان الله بڵێ. ئەبو هورەیرە لە پێغەمبەر ی خواوە ﷺ هێناویەتی کە فەرمویەتی:{كَلِمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِي المِيزَانِ حَبِيبَتَانِ إِلَى الرَّحمنِ: سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، سُبحَانَ اللهِ العَظِيم/ البخاري/ دوو وشەی سوکن لەسەر زمان، قورسن لە کێشانەی چاکەی بەندەدا، خۆشەویستن لەلای ڕەحمان ئەمانەن: (سُبحَانَ اللهِ وَبِحَمدِهِ، سُبحَانَ اللهِ العَظِيم) واتە: پاکو بێ عەیبی بۆ خوا لەگەڵ سوپاسکردنیدا، پاکو بێ عەیبی بۆ خوای گەورە}. تەسبیحات واتە: بە بیرو باوەڕو قسەو کردار شتێك نەکەیت کەشایانی زاتی خودا نەبێتو ببێت بەهۆی سوك ڕاگرتنی، بەڵکو پێویستە موسڵمان هەمیشە بە شێوەیەك ڕەفتار بکات کە گەورەیەتی خودای پێوە دیاربێت، وەك دەفەرموێ: ﴿پەروەردگارت ئەوسا گەورە بکە﴾مودەسیر/٣.. ﴿ ثُلَّةٌ ﴾ واتە بەش، پارچە، کۆمەڵێك کەژمارەی نەزانرێت. وتراوە مەبەست لە﴿ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴾ گەلانی پێشوە لەئادەمەوە تاخاتەم ﷺ.

## ٥٧ سورەتی حەدید ٢٩

سورەتی حەدید کە سورەتی پەنجاو حەوتەمی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوتە خوارەوە ئەمەش بیروڕای زۆربەی ڕاڤەکارانەو بیستو نۆ ئایەتە، ناسخو مەنسوخی تێدا نیە.

ئەم سورەتە یەکێك لەو سورەتانەیە کە پێیان دەوترێت: "الْمُسَبِّحَات" واتە ئەو سورەتانەی کە باس لە تەسبیحاتی پەروەردگار یان فەرمان بەو دەست پێدەکەن کە ئەم حەوت سورەتن: (الإِسْرَاء، الْحَدِيد، الْحَشْر،الصَّفّ،الْجُمُعَة، التَّغَابُن، الْأَعْلَى ) عیربازی کوڕی ساریە دەڵێت: {أَنَّ النَّبِي ﷺ كَانَ يَقْرَأُ الْمُسَبِّحَاتِ قَبْلَ أَنْ يَرْقُدَ وَيَقُولُ إِنَّ فِيهِنَّ آيَةً خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ آيَةٍ/ الترمذي، حسنه الألباني/ بێگومان پێغەمبەر پێش ئەوەی کە بخەوێت (الْمُسَبِّحَاتِ) دەخوێندو دەیفەرمو: بێگومان ئایەتێکیان لەناویدایە چاکترە لەهەزار ئایەت} وتراوە ئەو ئایەتە ئایەتی سێهەمی ئەم سورەتەیە، هەندێکیش وتویانە ئایەتی بیستویەکی سورەتی حەشرە، لە کۆتای سورەتی پێشودا کە سورەتی (الواقعە) بو، فەرمانی بە تەسبیحی پەروەردگار دا لەسەرەتای ئەم سورەتەشدا هۆکەی ڕون دەکاتەوە واتە: ﴿ فَسَبِّحۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلۡعَظِيمِ ﴾ خودای خۆت تەسبیحات بکەو ناوی بە پاکو بێ عەیب ڕابگرە چونکە ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾.

بەناوی ﷲ زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) تەسبیحاتی ﷲ دەکات ئەوەی کە لەناو ئاسمانانو زەویدایە و هەر خۆی دەسەڵاتدارو کاربەجێیە.

(السَّبَاحَة) واتە مەلەوانی، کە مەلەوان دەبێت هەمیشە لەجوڵەدا بێتو نابێت بێ ئاگاو کەمتەر خەم بێت ئەگینا دەخنکێت، جا ئێمەش داوای تەسبیحاتمان لێکراوە واتە: دەبێ مرۆڤی موسڵمان هەمیشە لەجموجوڵدا بێت بۆخواو لەیاد کردنی بێئاگا نەبێت، ئەگینا شەیتانو شەیتان سیفەتان زاڵ دەبن بە سەریداو فریوی دەدەن و داماوی دنیاو قیامەت دەبێت.

(٢) هەر موڵکی ئەوە ئاسمانانو زەوی، زیندو دەکاتەوەو دەمرێنێتو هەر خۆیەتی توانای بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو هیچ شتێك لە دەستی ئەو دەرناچێت.

(٣) هەر خۆی لە ئەوەڵەوە بووەو هیچ شت پێش ئەو نەبووەو، دوایش هەر ئەوەو هیچ شت پاش ئەو نیەو ئاشکراو زاڵ هەر ئەوەو هیچ شت لەو ئاشکراو زاڵتر نیەو پەنهان هەر ئەوەو هیچ

هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۚ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴿٤﴾ لَّهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ﴿٥﴾ يُولِجُ ٱلَّيۡلَ فِي ٱلنَّهَارِ وَيُولِجُ ٱلنَّهَارَ فِي ٱلَّيۡلِۚ وَهُوَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٦﴾ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَأَنفِقُواْ مِمَّا جَعَلَكُم مُّسۡتَخۡلَفِينَ فِيهِۖ فَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَأَنفَقُواْ لَهُمۡ أَجۡرٞ كَبِيرٞ ﴿٧﴾ وَمَا لَكُمۡ لَا تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ لِتُؤۡمِنُواْ بِرَبِّكُمۡ وَقَدۡ أَخَذَ مِيثَٰقَكُمۡ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴿٨﴾ هُوَ ٱلَّذِي يُنَزِّلُ عَلَىٰ عَبۡدِهِۦٓ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَكُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ بِكُمۡ لَرَءُوفٞ رَّحِيمٞ ﴿٩﴾ وَمَا لَكُمۡ أَلَّا تُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ لَا يَسۡتَوِي مِنكُم مَّنۡ أَنفَقَ مِن قَبۡلِ ٱلۡفَتۡحِ وَقَٰتَلَۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡظَمُ دَرَجَةٗ مِّنَ ٱلَّذِينَ أَنفَقُواْ مِنۢ بَعۡدُ وَقَٰتَلُواْۚ وَكُلّٗا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٞ ﴿١٠﴾ مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥ وَلَهُۥٓ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١١﴾

شتێکیش لەو پەنهان ترنیە و هەر خۆیەتی ئاگای لە هەمو شت هەیە.

بەشێك لە دوعای پێغەمبەرمان ﷺ لە کاتی خەوتندا ئەوە بو کە دەیفەرمو: {اللَّهُمَّ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَيْسَ قَبْلَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنَّا الدَّيْنَ وَأَغْنِنَا مِنْ الْفَقْرِ /مسلم وغيره/ ئەی خوایە هەر خۆتیت لە ئەوەڵەوە بویتو هیچ شت پێش خۆت نەبووەو دوایش هەر خۆتیتو هیچ شت پاش خۆت نیەو ئاشکراو زاڵ هەر خۆتیو هیچ شت لە خۆت ئاشکراو زاڵتر نیەو پەنهان هەر خۆتیو هیچ شتێکیش لەخۆت پەنهان ترنیە، قەرزەکانمان بۆبدەرەوەو لە کەمدەستی بێنیازمان بکە}.

﴿٤﴾ خۆی ئەو زاتەیە کە ئاسمانانو زەوی لە شەش ڕۆژدا دروستکردوە، پاشان بەو شێوە کە شایستەی ئەو زاتەیە لەسەر عەرش وەستاوە زانیاریشی هەیە بەسەر ئەوەدا کە دەچێتە ناو زەویو ئەوەی کە لە زەوی دێتە دەرەوەو ئەوەی دێتە خوارەوە لە ئاسمانو ئەوەی بەرزدەبێتەوە بۆ ئاسمانو ئەو لەگەڵتاندایە بە زانیاریو چاودێریو پاراستنتان لە هەر کوێدابنو خوا بینەری ئەو کردارانەیە کە ئێوە دەیکەن، لە فەرمودەدا هاتوە کە {أن تَعبُدَ اللهَ كَأنَّكَ تَرَاهُ فَإن لَمْ يَكن تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ /متفق عليه/ بەندایەتی خودا بکە وەك ئەوەی کە لەبەر چاوت بێ، جا ئەگەر تۆ ئەو نابینیت بێگومان ئەو تۆ دەبینێت}.

﴿٥﴾ هەر بۆ ئەوە خاوەنیەتی ئاسمانانو زەویو هەمو کاروبارێکیش هەر بە دەست ئەوەو چۆنی ئارەزۆ لێ بێت ئاوا لە نێوان بەندەکانیدا بڕیار دەدات.

﴿٦﴾ شەو دەخاتە ناو ڕۆژو ڕۆژیش دەخاتە ناو شەو و بەگوێرەی پێویستی مرۆڤ هەردەم لە یەکێکیان کەم دەکاتەوە بۆ ئەوی تریانو ئەو زانەرە بەوەی کە لەناو دڵەکانیدایە، هەموی دەزانێت بە گەورەو بچوکیەوە، جا چۆن دەبێ نەیزانێ کەخۆی دروستکەریەتی؟ ئینجا دەفەرموێ:

﴿٧﴾ باوەڕ بهێنن بە خواو بەپێغەمبەرەکەی ﷺ و لەو ماڵەی کە ئێوەی کردوە بە جێنشین تێیدا ببەخشن، جا ئەو کەسانەی لە ئێوە کە باوەڕیان هێناوەو ماڵیان بەخشیوە پاداشتێکی گەورەیان بۆ هەیە لە دە بەرامبەرەوە بۆ حەوت سەدو زیاتریش.

﴿٨﴾ ئەوە چیتانە وا باوەڕ بە خوا ناهێنن لە حاڵێکدا ئەم پێغەمبەرە ﷺ لەناوتاندایەو بانگتان دەکات تا باوەڕبهێنن بە پەروەردگارتان. وە بە ڕاستی ئەگەر ئێوە باوەڕداربن پەیمانی لێوەرگرتون بۆ باوەڕهێنانو پەیرەوی کردنی پەیامی ئیسلام، بونی پێغەمبەر خوا ﷺ لە نێوان خەڵکدا نیعمەتو بەڵگەیەکی رونە لە سەر ڕاستی ئەو پەیامە، چونکە ئەوان بەچاوی خۆیان موعجیزەکانو هەڵسوکەوتی ئەو پێغەمبەرەیانﷺ دەبینی هەندێك بەس بە بینینی دەم و چاوی ئەو پێغەمبەرە ﷺ ڕاستی ئەوە بانگەوازەیان بۆ دەردەکەوت، وەك عەبدوڵای کوڕی سەلام دەڵێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هات بۆ مەدینە: {فَجِئْتُ فِي النَّاسِ لِأَنْظُرَ إِلَيْهِ فَلَمَّا اسْتَبَنْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللهِ ﷺ عَرَفْتُ أَنَّ وَجْهَهُ لَيْسَ بِوَجْهِ كَذَّابٍ /الترمذي،صحح الالباني/ جا ئەو کاتە لەناو خەڵکدا هاتم بۆئەوەی تەماشای بکەم جا لە کاتێکدا چاك وردبومەوە لێی زانیم بەڕاستی ئەو دەموچاوە،دەموچاوی درۆزن نیە}.

خۆ ئەو پەیمانە کە لەم ئایەتەدا باسکراوە دەگونجێت ئەو پەیمانە بێت کە پەروەردگار لەکاتی ئادەمدا پەیمانی لەهەمو ڕۆڵەکانی ئادەم وەرگرتوە کە تەنها ﷲ پەروەردگاریانە یان ئەو پەیمانە بێت کە پێشەکی پێغەمبەرمان ﷺ وەریگرتوە لە خەڵكو پاشان دەیخاتەوە بیر ئەوان ، ئەوانیش هەتا کۆتایی دنیا دێت دەبێ ئەو پەیمانە بتەو ڕابگرن.

﴿٩﴾ هەر ئەوە کە چەندین بەڵگەی ڕۆشنی ناردە سەر بەندەی خۆی کە محمدە ﷺ بۆ ئەوەی ئێوە لە تاریکیەکانی نەزانیو گومڕاییو هەواو هەوەس پەرستی ڕزگار بکاتو بتانبات بۆ ڕوناکی ئاینی پیرۆزی ئیسلامو بێگومان کە خوا سەبارەت بە ئێوە

دڵسۆزو میهرەبانەو ئەم هەموو بەڵگە ڕوناکیانەی بۆ ناردوون تا سەرتان لێ نەشێوێت‌و گومڕا نەبن.

(١٠) ئەوە چیتانە کە نابەخشن لەڕێگای بڵاوکردنەوەی ئاینی خوادا؟ لە کەمدەستی‌و نەداری مەترسن خودا ئێوە بەو ماڵە تاقی دەکاتەوە، ئەگینا خۆی دەتوانێت هەمو باوەڕدارێك سەروەتمەند بکات، چونکە ئەوەی لە ئاسمانان‌و زەویدایە هەر بۆ خوا دەمێنێتەوەو ئێوە بەجێی دەهێڵن، ئەوەش بزانن کە ئەو کەسانەی کە لە پێش سەرکەوتنی مەکەدا شتیان بەخشیوە لەڕێگای بڵاوکردنەوەی پەیامەکەی خواداو شەڕیان کردوە لەسەری لەگەل باقی باوڕدارانی دوایدا وەك یەك نین ئەوانە پلەیان گەورەترە لەو کەسانەی کە لەپاشدا شتیان بەخشیوەو شەڕیان کردوە. جا هەمویان خودا بەڵێنی بەهەشتی پێداون‌و خوا ئاگادارە بەوەی کە ئێوە دەیکەن‌و بە هەر کەسێك پاداشتی خۆی دەداتەوە لە چاك‌و لە خراپ، لە زۆرو لە کەم. ئەم ئایەتە ڕێزو گەورەی یارانی پێغەمبەر ﷺ بەگشتی‌و بە تایبەت ئەوانەی کە لە پێش فەتحی مەکەدا ئیمانیان هێناوەو بە گیان‌وبە ماڵ لە خزمەت ئەو بانگەوازە پیرۆزەدا بوون. ئیبنو حەزم ئەم ئایەتە دەکات بە بەڵگە لە سەر ئەوەی کە یارانی پێغەمبەر ﷺ هەمویانی بە بێشك بەهەشتین بەڵام ئەوانەی کە پێش کەوتن اللَّهُ وەعدەی پلەی بەرزتری پێداون. خالید کوڕی وەلید لە گەڵ عەبدورەحمانی کوڕی عەوف دا دەمەقاڵەیەکیان بوو کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئەمەی بیست بە خالیدی فەرمو: {دَعُوا لِي أَصْحَابِي فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَنْفَقْتُمْ مِثْلَ أُحُدٍ أَوْ مِثْلَ الْجِبَالِ ذَهَبًا مَا بَلَغْتُمْ أَعْمَالَهُمْ/متفق عليه/ واز لە یارانی من بهێنن سوێند بەوەی کە گیانی منی بەدەستە ئەگەر وەك کێوی ئوحود یان وەك کێوەکان زێڕ ببەخشن بە کرداری ئەوان ناگەن} واتە ئەو یارانەم کە دواتر ئیمانی هێناوە با قسە بەو یارانەی من کە پێشتر ئیمانیان هێناوە نەڵێن‌و بزانن کە بە پلەی ئەوان ناگەن. جا ئەوانەی کە بە پلەو پایەی خالید ناگەن دەبێت چۆن ڕێز لە پێشکەوتوانی ئەسحاب بگرن‌و پلەو پایەیان بەرز بنرخێنن؟ پێغەمبەر ﷺ سەبارەت بە پلەکانی بەهەشت دەفەرموێ: {إِنَّ فِي الْجَنَّةِ مِائَةَ دَرَجَةٍ أَعَدَّهَا اللهُ لِلْمُجَاهِدِينَ فِي سَبِيلِهِ كُلُّ دَرَجَتَيْنِ مَا بَيْنَهُمَا كَمَا بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ/متفق عليه/ بێگومان لەناو بەهەشتدا سەد پلە هەیە کە خوا دایناوە بۆ غەزا کەرانی ڕێگای ئەو کە هەر دوو پلەیەك نێوانیان وەکو نێوانی ئاسمان‌و زەوییە}

ئەمە جیاوازی پلەی غەزا کەرانە لە ناو خۆیاندا، جا جیاوازی پلەی غەزاکەران‌و دانیشتوان دەبێت چەند بێت؟

يَوْمَ تَرَى ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتِ يَسْعَىٰ نُورُهُم بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَٰنِهِم بُشْرَىٰكُمُ ٱلْيَوْمَ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿١٢﴾ يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ قِيلَ ٱرْجِعُوا۟ وَرَآءَكُمْ فَٱلْتَمِسُوا۟ نُورًا فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ لَّهُۥ بَابٌۢ بَاطِنُهُۥ فِيهِ ٱلرَّحْمَةُ وَظَٰهِرُهُۥ مِن قِبَلِهِ ٱلْعَذَابُ ﴿١٣﴾ يُنَادُونَهُمْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ قَالُوا۟ بَلَىٰ وَلَٰكِنَّكُمْ فَتَنتُمْ أَنفُسَكُمْ وَتَرَبَّصْتُمْ وَٱرْتَبْتُمْ وَغَرَّتْكُمُ ٱلْأَمَانِىُّ حَتَّىٰ جَآءَ أَمْرُ ٱللَّهِ وَغَرَّكُم بِٱللَّهِ ٱلْغَرُورُ ﴿١٤﴾ فَٱلْيَوْمَ لَا يُؤْخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلَا مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مَأْوَىٰكُمُ ٱلنَّارُ هِىَ مَوْلَىٰكُمْ وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٥﴾ ۞ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ ٱللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ ٱلْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ ٱلْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿١٦﴾ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يُحْىِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٧﴾ إِنَّ ٱلْمُصَّدِّقِينَ وَٱلْمُصَّدِّقَٰتِ وَأَقْرَضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا يُضَٰعَفُ لَهُمْ وَلَهُمْ أَجْرٌ كَرِيمٌ ﴿١٨﴾

(١١) کێیە ئەو کەسەی کە قەرزی جوان بەخوا بدات؟ ئەوسا چەندقاتی دەکاتەوە بۆی و پاداشتی بەرێزیشی بۆ هەیە. جا لە دە بەرامبەرەوە بۆ حەوت سەد بەرامبەرو زیاتریش دەڕوات.

(١٢) ئەو ڕۆژەی کە تۆ دەبینیت پیاوان‌و ئافرەتانی باوەڕدار ڕوناکی کردارە چاکەکانیان لەلای ڕاستیانەوەو لەپێش دەمیانەوە دەڕوات، خۆشی‌و شادمانی ئێوە لەمڕۆدا باخچەیانێکە کە چەند جۆگەی بەناودا دەڕوات، بۆ هەمیشەیش تێیدا دەمێننەوە، ئەوە هەر خۆیەتی شادمانی‌و بەهرەی گەورە. کاتێك کە هەر کەس هەرچی پەرستوە لە دنیادا شوێنی ئەوە دەکەوێت‌و بەرەو دۆزەخ دەڕوات ئەوکاتە تەنها باوەڕداران‌و مونافقان دەمێنێنەوە، جا ئەو کاتە باوەڕدران اللَّهُ ڕوناکیان پێدەبەخشێت کە بەسەر پردی سیراتدا تێپەڕن، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {فَيُعطِيهم نُورَهم عَلَى قَدَرِ أَعمَالِهِم فَمِنهُم مَن يُعطَى نُورَهُ مِثلَ الجَبَلِ الْعَظِيمِ يَسعَى بَيْنَ أيدِيهِم وَمِنهُم مَن يُعطَى نُورَه أصغَرَ مِن ذَلِكَ وَمِنهُم مَن يُعطَى مِثلَ النَّخلَةِ بِيَدِهِ وَمِنهُم مَن يُعطَى أصغَرَ مِن ذَلِكَ حَتَى يَكونَ آخرُهُم رَجُلاً يُعطَى نُورَهُ عَلَى إِبْهَامِ قَدَمِهِ يضيء مَرَةً ويطفأ مَرَة فَإِذَا أَضَاءَ قَدَمَه قدم وإِذَا أُطفِىء قَامَ قَالَ وَالربُّ تَبارَكَ وَتَعَالَى أَمَامَهُم حَتَى يَمُرَّ بِهِم إلَى النَّارِ فَيبقى أثره كحد السيف دحض مزلة قَالَ فَيَقُولُ مُرُّوا فَيمُرُّون عَلَى قَدَرِ نُورِهِم مِنهُم مَن يمُرُّ كَطرفة الْعَينِ وَمِنهُم من يَمُرُّ كالْبرق وَمِنهُم مَن يمر كَالسَّحَابِ وَمِنهُم مَن يَمر كانقضاضِ الْكَوَاكِبِ وَمِنهُم مَن يمر كَالرِّيحِ وَمِنهُم مَن يَمر كَشد الفرس وَمِنهُم مَن يمر كَشدِ الرجل حَتَى يمر الَّذي

يعطى نوره عَلَى ظهر قَدَمَيهِ يحبو عَلَى وَجهِهِ ويديه ورجليه تخر يد وتعلق يد وتخر رجل وتعلق رجل وَتُصِيبُ جَوَانِبَهُ النَّارُ فلا يزال كذلك حتى يخلص فإذا خلص وقف عليها فقال الْحَمْدُ للهِ الذَّي أَعطَانِي مَا لَم يُعطِ أَحَدًا إِذْ أَنْجَانِي مِنهَا بَعدَ إِذْ رَأَيتُها/ ابن أبي الدنيا، صححه الألباني/ ئەوسا ڕووناکیەکانیان پێدەدات بەگوێرەی کردارەکانیان جا لەناویاندا هەیە کە روناکییەکی پێدەدرێت وەکو چیایەکی گەورەولەواندا هەیە کە لەوە بچوك تری پێدەدرێت، هەیانە کە وەك دارخورمایەکی پێدەدرێت کەبەدەستیویە، هەیشیانە لەوە بچوکتری پێدەدرێت هەتا کۆتاییەکەیان پیاوێکە کەروناکییەکەی لەسەر پەنجە بەرانەی پێی پێدەدرێت کە هەندێ جارڕۆشن دەبێت‌و هەندێ جاریش دەکوژێتەوە، جا هەرکاتێ ڕۆشن بو دەڕوات وهەرکاتیش کوژایەوە دەوەستێت، دەفەرموێ: پەروەردگاری بێ عەیبو بە شکۆ لەپێشیانەوەیە تا بەسەر ئەوئاگرەدا دەریان دەکات جا شوێنەواری دەمێنێتەوە وەك تیژای شمشێر کەخلیسکەو شوێن کەوتنە فەرموی: پێیان دەفەرموێ: بڕۆن جا بەگوێرەی روناکییەکەیان تێدەپەڕن کە لەناو ئەواندا کەسی وا هەیە وەکو چاوبرکەیەك تێدەپەڕێت‌و هەیانە وەك چەخماخەی هەور تێدەپەڕێت‌وهەشیانە کە وەك هەور دەڕوات‌و هی وایشیان هەیە وەك کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەکان دەڕواتوهی وایشیان هەیە وەك با دەڕوات‌و هی وایشیان هەیە وەك ئەسپێکی چاك دەڕوات، لەواندا کەسی واش هەیە کە وەك پیاوێکی بەهێز دەڕوات، کەسی وایش هەیە کە روناکییەکەی لەسەر هەردووپێیەتی بەگاوەڵکە لەسەر دمو چاوی‌و هەردوو دەستی‌و هەردووپێی دەڕوات کەدەستێکی دەخلیسکێت‌و بەدەستێکی دەگیرێتەوەو پێیەکی دەخلیسکێت‌و بەپێیەکی دەگیرێتەوەو هەمولایەکی ئاگری پێدەگات هەمیشە هەر وادەبێت هەتا ڕزگاری دەبێت، جا ئەو کاتە کە ڕزگاری بو لەسەری دەوەستێت‌و ئینجا دەڵێت: سوپاس بۆخوا شتێکی وای داوە بە من بەکەسی نەداوە کە ڕزگاری کردم لەوئاگرە پاش ئەوەی کە دیتم}
هەروەهاپێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {بَشِّرْ الْمَشَّائِينَ فِي الظُّلَمِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِالنُّورِ التَّامِّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ / الترمذي، صححه الألباني/ مژدە بدە بەوانەی کە لە تاریکاییەکاندا هاتوچۆی مزگەوتەکان دەکەن بە ڕۆشنای تەواو لە ڕۆژی قیامەتدا}.

(١٣) ئەو ڕۆژە پیاوان‌و ئافرەتانی دووڕوو دەڵێن: بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە ئا لایەکمان لێ بکەنەوە تا ئێمەیش کەمێك لەو ڕووناکیەتان وەرگرین بۆ ئەم ڕێگامانە، جا لەوێدا بە گاڵتەوە پێیان دەوترێت: بگەڕێنەوە بۆ پاش خۆتان تا لەوێدا ڕووناکیەك پەیدا بکەن، جا تا ڕوو دەکەنەوە بۆ پاش خۆیان دیوارێك لەنێوانیاندا پەیدا دەبێت کە دەرگای هەیەو ئیتر ڕێگایان لێدەگیرێت کە بە شوێن موسڵماناندا بڕۆن‌و لە ڕوناکی ئەوان سوود وەرگرن لە ناوەوەی ئەو دەرگایە بۆ باوەڕداران چاکەو نیعمەتی فرەوانەو دەرەکەیشی بۆ دووڕووەکان سزایەو دەبێت تێیدا بن، چونکە بەرهەمی کاری ناپەسەندی دنیای خۆیانەو خوا ستەم لە کەس ناکات،

(١٤) جا دووڕووەکان بانگیان دەکەن‌و دەڵێن: ئایا ئێمەیش هەر لەگەڵ ئێوەدا نەبوین لە دنیاداو هاتوچۆی مزگەوت‌و کاری چاك‌و شتی ترمان نەدەکرد؟ باوەڕدارانیش وەڵامیان دەدەنەوەو دەڵێن: بەڵێ لەگەل ئێمەدابون بەڵام ئێوە خیانەتتان بە خۆتان کردو خۆتان فریوداو چاوەڕێتان دەکرد تا بزانن باوەڕداران چیان بەسەر دێت‌و گومانتان هەبو لە ڕاستی‌و دروستی ئەم ئایینەداو ئاواتە زۆرو زەبەنەکەتان سەرگەرمی کردن تا فەرمانی خوا هات‌و مردن‌و شەیتان بە میهرەبانی‌و چاو پۆشی خودا فریوی دان‌و تەوبەتان نەکرد، جا بەڕاستی‌و بێ نیفاق‌و بێدوودڵی نەهاتنەوە بۆ لای خوداوئەوەش بەشتانە.

(١٥) جا ئەمڕۆ نە لە ئێوەی دووڕوو نە لەو کەسانەیش کە خوانەناس بوون هیچ فیدیەیەك وەرناگیرێت بۆ ڕزگاربوونتان ، جێگاتان ئاگرە، هەر ئەویشە دۆستی ئەمڕۆی ئێوەو پیسترین سەرئەنجامە ئەو شوێنە بۆتان. ئینجا بۆدنیامان دەهێنێتەوەو دەفەرموێ:

(١٦) ئایا کاتی ئەوە نەهاتوە بۆ ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە کە دڵیان بترسێت‌و ئامادەی یادی خوا بێت‌و پەیڕەوی بکات لەوەی کە بەڕاستی ڕەوانەی کردووەو نەبێت لەریزی ئەو کەسانەی کە پەڕاوی خودایان بۆ هات لەپێشدا، جا ماوەیەکی درێژ بەسەریاندا تێپەڕی ئەوسا دڵیان ڕەق بوو دورکەوتنەوە لێی‌و زۆربەیان لە سنوری ڕاستی تێپەڕین،
ئیبنو مەسعود دەڵێت: {مَا كَانَ بَيْنَ إِسْلَامِنَا وَبَيْنَ أَنْ عَاتَبَنَا اللهُ بِهَذِهِ الْآيَةِ أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَنْ تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللهِ إِلَّا أَرْبَعُ سِنِينَ/مسلم وغيره/ نێوان موسوڵمان بونی ئێمەو دابەزینی ئەم ئایەتە کە ﷲ سەرکۆنەی کردین تەنها چوار ساڵ تێپەڕیبوو} ئەمە تەنها چوار ساڵ تێپەڕیبوو بەسەر خەڵکی مەدینەدا کە ئەم ئایەتە دابەزیوەو سەرکۆنەی ئەو موسڵمانانە دەکات لەو سەردەمەدا ئەی دەبێت حاڵی ئێمە چۆن بێت ئێستا لەلای پەروەردگارمان؟ پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ أَوَّلَ مَا يُرْفَعُ مِنَ النَّاسِ الْخُشُوعُ/الطبراني، صححه الألباني/ یەکەم شت کە لەناو خەڵکدا هەڵدەگیرێت‌و نامێنێت ملکەچییەکی خۆشەویستانەیە بۆ خوا}

(١٧) بزانن کە زەوی پاش ئەوەی هەرچی لەسەرە لە گژوگیا وشك دەبێت‌و نامێنێت بێگومان هەر خودایە زیندوی دەکاتەوە

وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصِّدِّيقُونَۖ وَٱلشُّهَدَآءُ عِندَ رَبِّهِمۡ لَهُمۡ أَجۡرُهُمۡ وَنُورُهُمۡۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٩﴾ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞ وَزِينَةٞ وَتَفَاخُرُۢ بَيۡنَكُمۡ وَتَكَاثُرٞ فِي ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَوۡلَٰدِۖ كَمَثَلِ غَيۡثٍ أَعۡجَبَ ٱلۡكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصۡفَرّٗا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمٗاۖ وَفِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٞ شَدِيدٞ وَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضۡوَٰنٞۚ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلۡغُرُورِ ﴿٢٠﴾ سَابِقُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا كَعَرۡضِ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِ أُعِدَّتۡ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢١﴾ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِيٓ أَنفُسِكُمۡ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مِّن قَبۡلِ أَن نَّبۡرَأَهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٞ ﴿٢٢﴾ لِّكَيۡلَا تَأۡسَوۡاْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ وَلَا تَفۡرَحُواْ بِمَآ ءَاتَىٰكُمۡۗ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخۡتَالٖ فَخُورٍ ﴿٢٣﴾ ٱلَّذِينَ يَبۡخَلُونَ وَيَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبُخۡلِۗ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ ﴿٢٤﴾

(تا بەلگەیەك بێت لەسەر زیندوكردنەوەی ئێوەش) بە راستی ئێمە نیشانەكانی خۆمان بۆ ئێوە ڕۆشنكردوەتەوە، بەڵكو ئێوەیش تێبیگەن‌و لە بیری زیندو كردنەوەی خۆتاندا بن‌و بزانن چیتان بۆ ئامادەكردوە.

﴿١٨﴾ بێگومان ئەو پیاوو ئافرەتانەی كە چاكە دەكەن‌و قەرزی چاك بە خودا دەدەن، واتە: چاكەی بێ منەت، ئاشكرایە كە خودا نیازی بە پارەو ماڵی كەس نیە، بەڵام ئەو زاتە هەر چاكەیەك بكرێت لەگەڵ گیانلەبەرێكدا مرۆڤ یان جگە لە مرۆڤ بێت بە چاكە لەگەڵ خۆیدا دادەنێت‌و خۆی پاداشتی چاكەی چاكەكارەكە دەداتەوە، ئەمە بزانە بۆ هەمو شوێنەكانی تر شایەت لە شوێنێكی تردا ئەم قسەت بە بەرچاو نەكەوێت، جا خوا بەو باوەڕدارانە لە دە بەرامبەر بۆ حەوت سەد بەرامبەروزیاتریش پاداشت دەداتەوە، بەراستی پاداشتێكی بەرێزی سەخاوەتمەندانەیان بۆ هەیە.

﴿١٩﴾ جا ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوە بە خواو بەپێغەمبەرانی ئەوانەن ڕاستگۆیان‌و شایەتان لەلای پەروەردگاری خۆیان بەسەر باقی خەڵكانی تردا، ئەوانە لەلای خودا پاداشتیان هەیەو ڕووناكیش، جا ئەو كەسانەی كە خوانەناسبون‌و باوەڕیان بە نیشانەكانی ئێمە نەكردوە ئەوانە یارانی دۆزەخن (خودا پەنامان بدات لە دۆزەخ‌و ئەهلەكەی).

﴿٢٠﴾ چاك بزانن كە ژیانی دنیا گەمەو گاڵتەو سەرگەرمی‌و خۆجوانكردن‌و خۆهەڵكێشانە لەنێوان خۆتانداو فرەبوونی ماڵ‌و منداڵە هەروەك بارانێك وایە كە دانەوێڵە سەوز دەكات‌و جوتیاران سەریان سوڕماوە لەو گەشەو پێگەیاندنە پاشان پێدەگات‌و بەرەبەرە زەرد دەبێت پاشان وشك‌و ورد دەبێت، لە ڕۆژی دوایشدا سزای توند هەیە بۆ تاوانباران‌و لەلایەن خوداوە لێخۆشبون‌و ڕازی بونیش هەیە لە چاكەكاران، ئەوسا ژیانی دنیا هەر خۆشیەكی فریودەرەو هیچی تر، مەگەر بۆ ئەو كەسانەی كە ژیربن‌و بیكەن بە كێڵگەی باش بۆ دوارۆژیان. لە فەرمودەدا هاتوە كە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {لَلْجَنَّة أقْرَبُ إلَى أحَدِكُم مِن شِراكِ نَعلِهِ، والنَّارُ مثلُ ذَلِك /متفق عليه/ بێگومان كە بەهەشت بۆ هەر یەكێك لە ئێوە نزیكترە لە قەیتانی پێڵاوەكەی‌و ئاگریش هەروەك ئەوە} جا دەفەرموێ: كامیانت دەوێت هەر بەزویی پێی دەگەییت، ﷻدەفەرموێ:

﴿٢١﴾ دەی كێبڕكێ بكەن بۆ لێخۆشبون لەلایەن پەروەردگارتانەوەو بەهەشتێك كە پانایەكەی وەك پانایی ئاسمانان‌و زەوییە ئامادەكراوە بۆ ئەو كەسانەی كە باوەڕیان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرەكانی، ئەوە چاكەی خودایە دەیدات بەو كەسەی كە ئارەزۆی لێبێت‌و خودا خاوەنی چاكەی گەورەیە.

﴿٢٢﴾ هەر بەڵایەك لەم زەویەدا ڕوودەدات‌و هەر بەڵایەك بەسەر خۆتاندا دێت هەر هەموی نوسراوە لە (لەوحولمەحفوز)دا پێش ئەوەی ئەو خەڵكە دروست بكەین یان ئەو بەڵایە بخەینە ڕوو بێگومان ئەوەش لەلای خودا ئیشێكی ئاسانە، لە فەرمودەدا كە ئیمامی مسلم لە ئەبو هورەیرەوە كە لە پێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی هاتوە كە فەرمویەتی: {قَدَّرَ اللهُ المَقَادِيرِ قَبلَ أن يَخلُقَ السَّموتِ وَالأرض بِخَمسينَ ألفَ سَنَة/ متفق عليه/ خودا ئەندازەی هەمو شتێكی دیاری كردوە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی كە ئاسمانان‌و زەوی دروست بكات}.

﴿٢٣﴾ بۆ ئەوەی كە ئێوە شتێك كە لە دەستتان دەچێت خەم نەخۆن‌و لەخۆتانیش بایی نەبن بەو سەروەت‌و سامان‌و تەندروستی‌و شۆرەت‌و پلەیەی كە پێی داون، چونكە یەكەمیان تازە بۆت ناگەڕێتەوەو دووهەمیشیان تاقی دەكرێیتەوە، جا بەم زوانە یان ئەو لەدەست تۆدا نامێنێت یان تۆ بۆ بەكار هێنانی ئەو نامێنییت‌و دەڕۆیت. ئەوسا خودا مرۆڤی بە دەعیەو فیزو خۆبەزلزانی خۆش ناوێت، ئەوانە كێن؟ بەم ئایەتە وەڵامان دەداتەوە كە دەفەرموێ:

لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا رُسُلَنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَأَنزَلۡنَا مَعَهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمِيزَانَ لِيَقُومَ ٱلنَّاسُ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَنزَلۡنَا ٱلۡحَدِيدَ فِيهِ بَأۡسٞ شَدِيدٞ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥ وَرُسُلَهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ ﴿٢٥﴾ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحٗا وَإِبۡرَٰهِيمَ وَجَعَلۡنَا فِي ذُرِّيَّتِهِمَا ٱلنُّبُوَّةَ وَٱلۡكِتَٰبَۖ فَمِنۡهُم مُّهۡتَدٖۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ قَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِرُسُلِنَا وَقَفَّيۡنَا بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ وَجَعَلۡنَا فِي قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأۡفَةٗ وَرَحۡمَةٗۚ وَرَهۡبَانِيَّةً ٱبۡتَدَعُوهَا مَا كَتَبۡنَٰهَا عَلَيۡهِمۡ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ رِضۡوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوۡهَا حَقَّ رِعَايَتِهَاۖ فَـَٔاتَيۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنۡهُمۡ أَجۡرَهُمۡۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَءَامِنُواْ بِرَسُولِهِۦ يُؤۡتِكُمۡ كِفۡلَيۡنِ مِن رَّحۡمَتِهِۦ وَيَجۡعَل لَّكُمۡ نُورٗا تَمۡشُونَ بِهِۦ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٢٨﴾ لِّئَلَّا يَعۡلَمَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَلَّا يَقۡدِرُونَ عَلَىٰ شَيۡءٖ مِّن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَأَنَّ ٱلۡفَضۡلَ بِيَدِ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ ذُو ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

﴿٢٤﴾ ئەو كەسانەن كە خۆيان ڕژدی دەكەن لە پەیڕەوكردنی ئایینو بەخشینی ماڵداو فەرمانیش بە خەڵكی دەكەن كە ئەوانیش هەمان ڕێگای ئەوان بگرنە بەرو هەر كەسێك پشت لەو ئایینە بكات هەر خۆی زیانی پێدەگات، ئەوسا بێگومان كە خوا هەر خۆی بێنیازو ستایشكراوە لە ئاسمانانو لە زەویداو نیازی بە بەخشینو بەندایەتی ئێمە نیە، بەڵكو ئێمە نیازمان بەوەهەیە.

﴿٢٥﴾ بە ڕاستی ئێمە نێردراوەكانی خۆمان نارد، بە بەڵگەگەلێكی ڕۆشنەوەو پەڕاوو ترازومان پێدان تا خەڵكی بە دادپەروەرانە لەناو خۆیاندا بە یەكسانی ڕەفتار بكەنو ئاسن كە هێزێكی بتەوو خاوەنی سزای توندەو سوودیشی هەیە بۆ خەڵك پێمان داون تا دەربكەوێت بە ڕوونی كە كێ یارمەتی ئایینی خوداو پێغەمبەرانی دەداتو لەگەیاندنی پەیامەكەیدا لەو هێزە سوتێنەرو توندە ناسڵەوێتەوەو پشت بە خوا دەبەستێت كە بێگومان خودا بە هێزو بە دەسەڵاتەو كەس سەرناكەوێت بەسەریدا لە ململانی كردنیدا. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٢٦﴾ بە ڕاستی ئێمە نوحو ئیبراهیمیشمان ناردو لەناو نەوەكانیاندا پێغەمبەرایەتیو پەڕاومان پێدان واتە: ئەو چوار پەڕاوە: تەوراتو ئینجیلو زەبورو قورئان كە ئەوانە بە نەوەی ئیبراهیم دران جا هەندێك لەو خەڵكەی ئەوانیش ڕێگای خۆشبەختیان گرتو زۆریشیان لە سنوری خوداپەرستی لایانداو لاڕێ بون.

﴿٢٧﴾ پاشان بە شوێن ئەوانیشدا پێغەمبەرانێكمان ڕەوانە كردو عیسای كوڕی مەریەمیشمان بە دوای ئەواندا ناردو ئینجیلمان پێداو بەزەییو سۆزمان لەناو دڵی ئەو كەسانەدا دانا كە پەیڕەوی ئەویان كرد، جا خۆتەرخان كردن بۆ خوایشیان داهێنا كە ئێمە پێویستمان نەكردبو لەسەریان ئەوان گوایە هەر لەبەر ڕەزامەندی خودا ئەو كارەیان كردبو، بەڵام بەشێوەی گونجاو ڕاست ئەو بەندایەتیەیان نەبردە سەر، ئەوسا بەو كەسانەی كە باوەڕی هێنابو پاداشتی خۆیانمان پێدانو ئیشەكەیان بە بەلاش نەچوو، جا زۆربەی ئەوانیش لەسنوری ڕاستیو خوداپەرستی تێپەڕیبون.

﴿٢٨﴾ ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسنو باوەڕ بە پێغەمبەرەكەی كە محمدە ﷺ بكەن خوا لە سۆزو چاكەی خۆی پاداشتی دوو بەرامبەرتان پێدەداتو ڕووناكیەكتان پێدەدات كە ڕێگای پێ ببڕن لە دنیاو لەسەر پردی سیراتیشداو لێتان خۆشدەبێتو خودا لێبوردەو میهرەبانە بۆ بەندەكانی. هەندێ لەزانایان پێیان وایە ئەم ئایەتە ڕو لە ئەهلی كیتاب دەكات كە با باوەڕ بهێنن بە محمد، ئەوسا پاداشتی دوو بەرامبەریان بۆ هەیە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {ثَلاثَةٌ يُؤْتَوْنَ أَجْرَهُمْ مَرَّتَيْنِ رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ آمَنَ بِنَبِيِّهِ وَأَدْرَكَ النَّبِيَّ ﷺ فَآمَنَ بِهِ وَاتَّبَعَهُ وَصَدَّقَهُ فَلَهُ أَجْرَانِ وَعَبْدٌ مَمْلُوكٌ أَدَّى حَقَّ اللهِ تَعَالَى وَحَقَّ سَيِّدِهِ فَلَهُ أَجْرَانِ وَرَجُلٌ كَانَتْ لَهُ أَمَةٌ فَغَذَّاهَا فَأَحْسَنَ غِذَاءَهَا ثُمَّ أَدَّبَهَا فَأَحْسَنَ أَدَبَهَا ثُمَّ أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا فَلَهُ أَجْرَانِ /متفق عليه/ سێ كەس هەن كەپاداشتی دوو بەرامبەریان بۆ هەیە،پیاوێك لەئەهلی كتاب كەباوەڕی بەپێغەمبەرەكەی خۆی هێنابێتو گەیشتبێت بەم پێغەمبەرە ﷺ، جا باوەڕی پێكردبێت ودوای كەوتبێتوبەڕاستی زانیبێت ئەوسا ئەوە پاداشتی دوو بەرامبەری بۆهەیە، بەندەیەك كەبەندەی كەسێك بێت كە مافەكانی ﷲ جێ بەجێ بكاتومافی خاوەنەكەشی ئەوەش پاداشتی دوو بەرامبەری بۆ هەیە، وە كەسێكیش كە كەنیزەیەكی هەبێت جا خواردنی پێبدات بەخواردنێكی باش، جا بەشێوەكی جوانیش پەروەردەی بكاتو پاشان ئازادی بكاتو ئینجا بیبدات بەشو، ئەوسا ئەویش پاداشتی دوو بەرامبەری بۆهەیە} جا دەگونجێت ئەمە تایبەت بە ئەهلی كتاب نەبێت، بەڵكو بەگشتی هەمو ئەوانەی كە لەخوا دەترسنو بە پێغەمبەرایەتی محمدی ﷺ كوڕی عبدﷲ باوەڕیان هێناوە، لەم ئایەتەدا پەروەردگار بەسۆزو چاكەی خۆی بەڵێنی پاداشتی

دوو بەرامبەریان پێدەدات چونکە ئەوان هەم باوەڕیان بە محمدو قورئان هێناوەو هەم بە پێغەمبەرانی پێشویش.

(٢٩) تا ئەهلی کتاب وا نەزانن لەو چاکەی کە لەلای خودایە ئەوان هیچیان بەدەستە، خۆ بێگومان هەرچی هەیە هەربە دەستی خودایە، دەیدات بەو کەسەی کە ئارەزۆی لێ بێت و اللّٰهُ ﷻ خاوەنی خێرو چاکەی گەورەیە.

## سورەتی موجادلە ٥٨ ٢٢

سورەتی موجادلە کە سورەتی پەنجاو هەشتەمی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، بیستو دوو ئایەتە.

هەروەها بە سورەتی(قَدْ سَمِعَ) و (الظهار)یش ناوبراوە، ئایەتی سیانزەهەمینی ناسخی ئایەتی دوانزەهەمیەتی، ئەم سورەتە سەرەتای نیوەی دووهەمی قورئانە بەگوێرەی ژمارەی سورەتەکان چونکە سورەتی پەنجاو هەشتەمینە، وە سەرەتای بەشی دەیەمی قورئانە بەگوێرەی جوزئەکانی قورئان و هیچ ئایەتێکی ئەم سورەتە نیە مەگەر ناوی خوای بە وشەی بەرزی (اللّٰه)ی جارێك یان دوو یان سێ جاری تێدا هاتبێت.

لە سورەتی پێشودا باس لە سیفەتە بەرزەکانی اللّٰه کرا کە لەوانە زانیاریو ئاگاداری پەروەردگار بە بەندەکانی، هەروەها باس لەوەکرا کە لەهەر کوێدا بن لەگەڵیاندایە جا لەم سورەتەدا بەباسکردنی چەند رووداوێك راستی ئەو سیفەتانە دەچەسپێنێت ماناکانیان لە(علم اليقين)ـەوە دەکات بە(عين اليقين).

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

خاتون عائیشەی دایکی باوەڕداران (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێت: {الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي وَسِعَ سَمْعُهُ الْأَصْوَاتَ لَقَدْ جَاءَتْ الْمُجَادِلَةُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ وَأَنَا فِي نَاحِيَةِ الْبَيْتِ تَشْكُو زَوْجَهَا وَمَا أَسْمَعُ مَا تَقُولُ فَأَنْزَلَ الله ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ﴾ الی ﴿وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤)﴾ / أحمد، صححه الألباني/ سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە هەمو دەنگێك دەبیستێت، بەڕاستی ئەو ئافرەتە کێشەی خۆی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ باسکرد من لە گۆشەیەکی ئەو ژوورەدا بوم لە زۆر قسەی حاڵی نەبوم بەڵام پەروەردگار ئەمەی نارده خوارەوە ﴿بە ڕاستی خودا بیستی قسەی ئەو ئافرەتەی کە بۆتۆی دەکرد لەبارەی مێردەکەیەوە﴾}

(١) بە ڕاستی خودا بیستی قسەی ئەو ئافرەتەکە ناوی خەولەی کچی سەعلەبە بو لەگەڵ تۆدا لەبارەی مێردەکەیەوە کە ناوی ئەوسی کوڕی سامیت بو قسەی دەکردو شکاتی خۆی هێنایە لات(وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لاوی خواردمو سکم بۆی تەکاند تا پیربوم و لە منداڵکردن کەوتم، کەچی ئێستا زیهاری

سُورَةُ المُجَادَلَةِ ٥٨ ٢٢

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ (١) الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ (٢) وَالَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِن نِّسَائِهِمْ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا قَالُوا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مِّن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا ذَٰلِكُمْ تُوعَظُونَ بِهِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ (٣) فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ مِن قَبْلِ أَن يَتَمَاسَّا فَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ذَٰلِكَ لِتُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَتِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤) إِنَّ الَّذِينَ يُحَادُّونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ كُبِتُوا كَمَا كُبِتَ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ وَقَدْ أَنزَلْنَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ مُّهِينٌ (٥) يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ اللَّهُ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا أَحْصَاهُ اللَّهُ وَنَسُوهُ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ (٦)

لەگەڵ مندا کردوە واتە وتبوی: (أنتِ عَلَيَّ كَظَهرِ أمِّي/ تۆ لای من وەکو پشتی دایکم وایت) ئەمەش لە پێشدا وەك تەڵاق بو، جا هەرچەندە مێردەکەی ویستبوی لەگەڵیدا هاوجێ بێت نەیهێشتبو وتبوی: نابێت نزیکم بکەویتەوە هەتا خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ لەمبارەوە بڕیار نەدەن، جا ئەمەی بە پێغەمبەر ﷺ، وت: پێغەمبەریش ﷺ هەر دەیفەرمو: ئەی خەولە ئامۆزاتەو پیرە لە خوا بترسە سەبارەت بەو، دەڵێت: بە خوا لەو جێگادا نەجولابوم قورئان دەربارەی من هاتە خوارەوە، جا پێغەمبەرﷺ داپپۆشی ئەوەی کە دایپۆشی لەکاتی هاتنی وەحیدا، پاشان ئەوەی لەسەر نەماو پێی فەرمو: (ئەی خەولە خوا سەبارەت بە خۆتو بە هاوسەرەکەت قورئانی ناردوەو پاشان ئەم ئایەتانەی بە سەرمدا خوێندەوە ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ ...الی...وَلِلْكَافِرِينَ عَذَابٌ أَلِيمٌ (٤)﴾

بەڵێ: بەڕاستی خوا بیسەری هەمو قسەیەکەو بینەری هەمو هەڵسوکەوتێکە، جا ئەگەر ئاگاییو زانیاری بەهەمو شتێك نیە چۆن ئەورووداوەی بیست لەهۆدەیەکدا کەخاتون عائیشە لە گۆشەیەکیدایەو دەڵێت: ئەو ئافرەتە ئەوەندە بەهێواش قسەی دەکرد من لەزۆر قسەی تێ نەدەگەیشتم؟ جا دەفەرموێ:

(٢) ئەو کەسانەی کە بە ژنانی خۆیان دەڵێن: تۆ وەکو پشتی دایکم یان وەکو دایکمی یان شتێکی لەو شێوەیە ئەوانە بەو قسەیە نابن بە دایکیانو حەرام نابن لەسەریانو دایکیان تەنها ئەو ئافرەتانەن کە ئەوان لێی پەیدابون، بێگومان ئەوانە قسەیەکی

أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ مَا يَكُونُ مِن نَّجْوَىٰ ثَلَٰثَةٍ إِلَّا هُوَ رَابِعُهُمْ وَلَا خَمْسَةٍ إِلَّا هُوَ سَادِسُهُمْ وَلَآ أَدْنَىٰ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكْثَرَ إِلَّا هُوَ مَعَهُمْ أَيْنَ مَا كَانُوا۟ ۖ ثُمَّ يُنَبِّئُهُم بِمَا عَمِلُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴿٧﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نُهُوا۟ عَنِ ٱلنَّجْوَىٰ ثُمَّ يَعُودُونَ لِمَا نُهُوا۟ عَنْهُ وَيَتَنَٰجَوْنَ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَإِذَا جَآءُوكَ حَيَّوْكَ بِمَا لَمْ يُحَيِّكَ بِهِ ٱللَّهُ وَيَقُولُونَ فِىٓ أَنفُسِهِمْ لَوْلَا يُعَذِّبُنَا ٱللَّهُ بِمَا نَقُولُ ۚ حَسْبُهُمْ جَهَنَّمُ يَصْلَوْنَهَا ۖ فَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ ﴿٨﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا تَنَٰجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَمَعْصِيَتِ ٱلرَّسُولِ وَتَنَٰجَوْا۟ بِٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾ إِنَّمَا ٱلنَّجْوَىٰ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ لِيَحْزُنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَيْسَ بِضَآرِّهِمْ شَيْـًٔا إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٠﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُوا۟ فِى ٱلْمَجَٰلِسِ فَٱفْسَحُوا۟ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُوا۟ فَٱنشُزُوا۟ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ دَرَجَٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿١١﴾

خوێنتاڵو درۆ دەکەن، پێویستە لێی پەشیمان ببنەوە بەڕاستی خوا دەبورێتو چاپۆشی لە تاوان دەکات. ئینجا پەروەردگار باسی فیدیەی ئەو قسە ناشیرینە دەکاتو دەفەرموێ:

(٣) جا ئەو کەسانەی کە ئەم قسەیە لەگەڵ ژنانی خۆیاندا دەکەن (الظِهار)و پاشان پەشیمان دەبنەوە لەو قسەی کە کردویانەو دەیانەوێت ئەم ژنانە هەر حەڵاڵو هاوسەری خۆیان بن، پێویستە یەکێك لەم سێ ڕێگایە ئەنجام بدەن،

**یەکەم**: ئازادکردنی بەندەیەکی ئیماندار پێش ئەوەی هاوجێگای لەگەڵ ئەو هاوسەرەیدابکات، ئەوەیە کە ئێوەی پێ ئامۆژگاری دەکرێتو ﷲ زۆر بە ئاگایە بەوەی کە ئێوە دەیکەن، ئینجا بۆ**دووهەم**و **سێهەم**، دەفەرموێ:

(٤) ئەوسا هەر کەسێك توانای ئازاد کردنی بەندەی نەبێت دەبێت دوو مانگ لەسەریەك ڕۆژوو بگرێت پێش ئەوەی بچێتە لای خێزانی، **سێهەمیش**: ئەگەر توانای ئەو دوو مانگە ڕۆژووەی نەبو دەبێت خواردنی شەست هەژار (خواردنێکی مامناوەندی) بدات ئەویش دیسان پێش چوونە لای خێزانی، پاشان دەفەرموێ: ئەمە بۆ ئەوەیە کە ئێوە باوەڕ بهێنن بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ ، جا ئەوەیە سنورەکانی خودا نەیبەزێننو بۆ خوانەناسانیش سزایەکی بەژان هەیە. دەڵێن: کە سەلمانی کوڕی سەخری ئەنساری کەسێکی تیرەی بەنی بەیاڵەیە ژنەکەی خۆی دانا بە پشتی دایکی هەتا ڕەمەزان بچێت جا کاتێ کە نیوەی ڕەمەزان ڕۆیشت جیماعی لەگەڵدا کرد، ئینجا چوە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ و روداوەکەی بۆ باسکرد، ئەوسا پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمو: {أَعْتِقْ رَقَبَةً قَالَ لَا أَجِدُهَا قَالَ فَصُمْ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ قَالَ لَا أَسْتَطِيعُ قَالَ أَطْعِمْ سِتِّينَ مِسْكِينًا قَالَ لَا أَجِدُ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِفَرْوَةَ بْنِ عَمْرٍو أَعْطِهِ ذَلِكَ الْعَرَقَ وَهُوَ مِكْتَلٌ يَأْخُذُ خَمْسَةَ عَشَرَ صَاعًا أَوْ سِتَّةَ عَشَرَ صَاعًا إِطْعَامَ سِتِّينَ مِسْكِينًا / الترمذي، صححه الألباني/ بەندەیەك ئازاد بکە وتی:دەستم ناکەوێت، فەرموی: دەی دوومانگ لەسەریەك ڕۆژو بگرە وتی: ناتوانم، فەرموی: خواردنی شەست هەژار بدە وتی: دەستم ناکەوێت، جا پێغەمبەری خوا ﷺ بە فەروەی کوڕی عەمری فەرمو: ئەو سەبەتەی بدەرێ کە زەمبیلەیەك بو پانزە یان شانزە مەن خورمای تێدا بو کە خواردنی شەست هەژار بو} بۆئەوەی لەباتی ئەو قسەیەدا بیدات بە شەست هەژار. ئەم باسە پێی دەوترێت (الِظهَار)و ئەوەش کەفارەتەکەی بو، لێرەوە دەردەکەوێت کە مەنێك بەشی چوار هەژارە لەکەفارەتی زیهاردا، کە دەکاتە ئەندازەی سەرفیترەی سەری یەك کەس.

(٥) بێگومان ئەو کەسانەی کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکەن رسواو سەرشۆڕ کراون هەروەکو چۆن ئەو کەسانەی پێش ئەوان سەرشۆڕو زەبونکران، جا بەراستی ئێمە نیشانەکانی ڕوناك کەرەوەمان نارد بۆ ئەوەی کەخەڵکی ڕێگای ڕاست بگرێتو بۆ خوانەناسانیش سزای وامان داناوە کە سزاکە خۆی گاڵتەیان پێدەکات، لەناو ئاگری دۆزەخداو هەڵبەزو دابەزو یاریان پێدەکات.

(٦) ئەو ڕۆژەی کە خوا هەمویان زیندو دەکاتەوە ئەوسا پێیان دەفەرموێت چییان کردوە، خودا هەمو قسەو کرداری ئەوانی ژماردوەو خۆیان لەبیریان چوەتەوەو ﷲ ﷻ ئاگای لە هەمو شتێك هەیە.

(٧) ئایا نازانی کە بێگومان ﷲ دەزانێت بەوەی کە لەناو ئاسمانانو لەناو زەویدایە هیچ سێ کەسێك قسە ناکەن مەگەر خودا چوارەمیان بێت (بەو شێوەی کە شایستەی مەقامی خۆیەتیە)، وە هیچ پێنج کەسێکیش نیە مەگەر خودا شەشەمیان بێت، و نە کەمتر لەوەو نە زیاتر لەوەش نیە مەگەر خودایان لەگەڵدا بێت لە هەرکوێدا بن، واتە کەس نیە کە ﷲ ﷻ بەو نەزانێت بەڵکو بەو شێوەی کە شیاوی ئەو زاتەیە لەگەڵێدایە، کە پاشان لە ڕۆژی قیامەتدا پێیان دەڵێت: کە چیان کردوە، بێگومان کە خوا زانیاری بەسەر هەمو شتێکدا هەیە، ئەم ئایەتە هەروەك بە عیلم دەستی پێکردو بە عیلمیش کۆتای پێهات بەڵگەیشە لەسەر کەماڵی عیلمی ﷲ ﷻ.

(٨) ئایا تۆ نەتبینی ئەوانەی کە بەرگری کرابوون لە چپەکردن، پاشان ئەوەی کە لێیان قەدەغە کرابو کردیانەوەو بۆ تاوان‌و دوژمنایەتی‌و سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ لەناو خۆیاندا چپە دەکەن‌و هەر کاتێك دێنە لای تۆ سەلامت لێدەکەن بە شێوەیەك کە خوا بەو شێوەیە سەلامی لێ نەکردویت، دەیان وت (السَّامُ عَلَيْكَ/ بمریت)و لە دڵی خۆیاندا دەیان وت: بلێیت خودا لەسەر ئەوەی کە دەیڵێین سزامان بدات؟ خوا دەفەرموێ: جەهەنم بەسە بۆیان کە دەخرێنە ناویەوە، ئەوسا خراپترین جێگایە بۆیان ئەودۆزەخە.

لەخاتون عائیشەی دایکی باوەڕدارانەوە(خوالێی رازی بێت) هاتوە کەجولەکەکان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ و وتیان: (السَّامُ عَلَيْكُمْ /بمرن ) جا دایکمان عائیشە وتی: ئێوە بمرن‌و نەفرینی خواتان لێ بێت‌و غەزەبی خوا برژێت بەسەرتاندا پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {مَهْلًا يَا عَائِشَةُ عَلَيْكِ بِالرِّفْقِ وَإِيَّاكِ وَالْعُنْفَ وَالْفُحْشَ قَالَتْ أَوَلَمْ تَسْمَعْ مَا قَالُوا قَالَ أَوَلَمْ تَسْمَعِي مَا قُلْتُ رَدَدْتُ عَلَيْهِمْ فَيُسْتَجَابُ لِي فِيهِمْ وَلَا يُسْتَجَابُ لَهُمْ فِيَّ/متفق عليه/ ئەی عائیشە هێواشبە، دەبێ نەرمونیان بیت‌و دورکەوەرەوە لە توندوتیژی‌و قسەی پیس وتی: تۆوام پێدەڵێیت!ئەی گوێت لێ نەبوچیان وت؟ فەرموی: ئەی تۆگوێت لێ نەبو ئەوەی من وتم: وەڵامم دانەوە، جا دوعای من وەرگیرا لە دژی ئەوان لە حاڵێکدا کەدوعا لەوان وەر نەگیرا لەدژی من}. بەڵێ خوانەناس شەرمی لەهیچ نیەو هەرچی بەدەمیابێت لەخراپە نایگەڕێنێتەوە.

(٩) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کاتێك چپەتان کرد هەرگیز بۆ گوناح و دوژمنایەتی‌و دژایەتی فەرمانی پێغەمبەر ﷺ چپە نەکەن، بەڵکو بۆ چاکەو پارێزکاری چپە بکەن‌و لەو خوایە بترسن کە سەرئەنجام لەلای ئەو کۆ دەکرێنەوە بۆ حیساب‌و پاداشت‌و سزا. ئیسلام ئا بەو شێوەیە پەیڕەوانی خۆی تەمێ دەکات. ئینجا دەفەرموێ:

(١٠) چپە هەر لە شەیتانەوەیە بۆ ئەوەی باوەڕداران خەمبار بکات خۆ مەگەر بە ئیزنی خوا ئەگینا هیچ زیانێك بەوان نادات دەی سا باوەڕداران با هەر بە خوا پشت ببەستن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الْآخَرِ حَتَّى تَخْتَلِطُوا بِالنَّاسِ مِنْ أَجْلِ أَنْ يُحْزِنَهُ/متفق عليه/ ئەگەر سێ کەسبون دوانتان چپە نەکەن بەیەکەوە بێ ئەویترتان تا تێکەڵاو دەبن بە خەڵك چونکە ئەو چپەیە ئەویتریان خەمبار دەکات}

(١١) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە هەر کاتێك پێیان وتن لە دانیشتندا ماوەو دڕن بدەن‌و جێگای یەکتر بکەنەوە دەی

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَٰجَيۡتُمُ ٱلرَّسُولَ فَقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَةٗۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ وَأَطۡهَرُۚ فَإِن لَّمۡ تَجِدُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ (١٢) ءَأَشۡفَقۡتُمۡ أَن تُقَدِّمُواْ بَيۡنَ يَدَيۡ نَجۡوَىٰكُمۡ صَدَقَٰتٖۚ فَإِذۡ لَمۡ تَفۡعَلُواْ وَتَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۚ وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ (١٣) ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ تَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مَّا هُم مِّنكُمۡ وَلَا مِنۡهُمۡ وَيَحۡلِفُونَ عَلَى ٱلۡكَذِبِ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ (١٤) أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابٗا شَدِيدًاۖ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ (١٥) ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ فَلَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ (١٦) لَّن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ (١٧) يَوۡمَ يَبۡعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعٗا فَيَحۡلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحۡلِفُونَ لَكُمۡ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍۚ أَلَآ إِنَّهُمۡ هُمُ ٱلۡكَٰذِبُونَ (١٨) ٱسۡتَحۡوَذَ عَلَيۡهِمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَأَنسَىٰهُمۡ ذِكۡرَ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ حِزۡبُ ٱلشَّيۡطَٰنِۚ أَلَآ إِنَّ حِزۡبَ ٱلشَّيۡطَٰنِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ (١٩) إِنَّ ٱلَّذِينَ يُحَآدُّونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ٱلۡأَذَلِّينَ (٢٠) كَتَبَ ٱللَّهُ لَأَغۡلِبَنَّ أَنَا۠ وَرُسُلِيٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٞ (٢١)

ئێوەیش دڕن بدەن‌و جێگای یەکتر بکەنەوە، خوداش جێگای ئێوە دەکاتەوەو هەر کاتێکیش وتیان: هەستن، هەستن ( بۆ رێز لەیەکتر گرتن‌و جێگای یەکترکردنەوە )چونکە خوا پلەی ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە لەناو ئێوەدا ئەی خەڵکینە بەرزکردوەتەوە، ئەوانەش کە خاوەنی زانیارین چەندین پلەی زیاتریان پێدراوەو خوا زۆر بەئاگایە لەوەی کە ئێوە دەیکەن. لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین:

**یەکەم:** هەستان لەبەر خەڵك لە جێگای دانیشتنیاندا شتێکی باشە، ئەوەش ئەوەیە کە مرۆڤ لەبەر حاکمی ئەو جێگایە، یان رێبوارو میوانی تازە هاتو یان پێویستی بە چەند کەسێك کە نزیك بن لە ئیمامەوەو کەسانی تری پێش ئەوان جێگەیان گرتبن کە ئەوەندە پێویست نەبن بەو ئیشەی کە ئیمام دەیەوێت باسی لێوەبکات، واتە: شتێك بێت مەبەستێکی گرنگی پێوە گرێدرابێت.

**دووهەم:** باش نیە هەستان لەبەر کەسێك بەو شێوە نەبێت کە باسمان کرد یان بوەستێت لە بەردەمیداو ئەو دانیشتبێت یان کەسێکی گەورەو زانا هەر کاتێك بێت‌و بڕوات لە مەجلیسێکدا لەبەری هەستن ئەوە ڕەوشتی ئاگر پەرستانە نەموسڵمانان، پێغەمبەرمان دەفەرموێ: {مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَتَمَثَّلَ لَهُ الرِّجَالُ قِيَامًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ /ابن ماجة، صححه الألباني/ هەر کەس پێی خۆش بێت کە خەڵك لەبەردەمیدا وەك هەیکەل بوەستن، جا با جێگای خۆی خۆش بکات لەناو ئاگردا} .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {لايُقيمُ الرَّجُلَ مِن مَجلِسِهِ فَيَجلِسَ فِيهِ، وَلَكِن تَفَسَّحُوا وَتَوَسَّعُوا/ متفق عليه/ هیچ پیاوێك پیاوێكی تر لەو جێگایەی كەدانیشتوە هەڵنەستێنێتو خۆی دانیشێت لەو جێگایەدا، بەڵام درن بدەنو جێگای دانیشتنەكە فرەوان بكەن} .

دەبێت مانای ئایەتەكەو مانای ئەم فەرمودەیانەش بەو شێوەیە بۆمان شی كردنەوە كاریان پێ بكرێت، جا دژایەتی نامێنێت. واللهُ أعلم. وە لەم ئایەتەدا ئاماژە بە پلەو پایەی زانایان دەكات، ئینجا پەروەردگارمان موسڵمانان تەمێ دەكات كە چۆن قسە بكەن لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ و دەفەرموێ:

(١٢) ئەی ئەو كەسانەی كە باوەڕتان هێناوە هەر كاتێك چپە بكەن لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ دەبێت پێش ئەوەی كاتی بگرن بەو چپەكردنە چاكەیەك بكەن، ئەوە باشە بۆتانو پاكەوەكەرترتانە لە تاوان، ئەوسا ئەگەر هیچتان دەست نەكەوت بیكەن بە چاكە ئەوە بێگومان كە خوا داپۆشەری تاوانەكانتانەو میهرەبانە بۆ بەندەكانیو گوناهتان لەسەر نانوسرێت ئەگەر چپەتان كرد لەگەڵیدا، بەڵێ پێغەمبەرﷺ بۆ هەمو مرۆڤەو شتێكی چاك نیە كەسێك بۆ ئیشی تایبەتی خۆی كاتی بگرێتو قسەیەكی لەگەڵدا بكات كە كەسێكی تر سودی لێ وەرنەگرێت، جا ئەگەر وای كرد با چاكەیەك بكات لەگەڵ هەژارانی باوەڕدارانda تا ئەو كات گرتنەی بۆخۆی بۆ پڕ بكاتەوە، لێرەدا موسڵمانانی تێگەیاند كە كات گەلێك بەنرخە بەتایبەت كاتی پێغەمبەرﷺونابێ بەشتی كەمەوە لەدەست بدرێتو هەموخەڵك لە كاتە كانی ئەودا شەریكن . جا ئەگەر دەسەڵاتی نەبو ئەویش هەر ئوممەتی ئەوەو ئەوەندەی پێدەبرێتو خوایش چاوپۆشی لێدەكات تا ئیتر نەزانەكانیش هەر لەخۆیانەوە كاتی نەگرن، پێغەمبەرمان ﷺ بە شەرم بوە لەسەرخۆی نەهاتوتە جواو بەڵام خوا موسڵمانان تەمێ دەكاتو خەڵك هەمو بەندەی ئەونو شەرمیان لێ ناكاتو هەمو راستیەكیان بۆ باس دەكات. ئینجا دەفەرموێ:

(١٣) ئایا بەلاتانەوە سەختە پێش ئەوەی چپە بكەن چاكەگەلێك بكەن؟ ئەوسا ئەگەر نەتانكردو خوا ئەو بارەی لەسەر لابردن دەی سا نوێژەكانتان بكەنو زەكات بدەنو پەیڕەوی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەكەی ﷺ بكەن، ئەوسا خوا زۆر بەئاگایە بەوەی كە ئێوە دەیكەن. جا اللهُ ﷻ پاش ئەوەی موسڵمانانی وشیاركردەوە لەبارەی كاتەكانی پێغەمبەرمان ﷺ وتێیگەیاندن كە بە سوكی تەماشای كاتەكانی مەكەن، بەم ئایەتە بڕیاری ئایەتی پێشخۆی لەسەر موسڵمانان سوك كرد.

(١٤) ئایا تۆ ئەوانەت نەبینی كە دۆستایەتیان كرد لەگەڵ گەلێكدا كە خوا غەزەبی لێگرتوون كەجوەكان بون، ئەوانە نە لە ئێوەنو نەلە ئەوانیشنو بە درۆ سوێند بە خوا دەخۆنو خۆیشیان دەزانن كە درۆ دەكەن واتە: مرۆڤە دووڕوەكان نە لەگەڵ موسڵماناندانو نە لەگەڵ خوانەناسان بەڵكو بەوروشتە بێ نرخانەیان دەیانەوێت لە هەردوولا بخۆن، بەڵام زۆر نابات لە هەردوولا ڕسوا دەبنو ڕۆژی قیامەتیش لەسزادراوان دەبن.

(١٥) خوای خاوەن دەسەڵات سزای توندی ئامادەكردوە بۆیان، چونكە بەڕاستی ئەوان ئیشی زۆر خراپیان دەكرد.

(١٦) سوێندەكانی خۆیان كردوە بە سپێر بۆ خۆیان تا خەڵك بە چاكیان بزانێت كەچی ئەوان ڕێگای بڵاوكردنەوەی ئایینی خودا دەگرن، جا بۆ ئەوان سزایەك هەیە كە گاڵتەیان پێ دەكات، چونكە ئەوان بەو كردارەیان گاڵتەیان بەموسڵمانان دەكرد.

(١٧) ئەوان نە سەروەتو سامانیانو نە منداڵانیان لەلای خوا هەرگیز هیچ سوودێك بەوان ناگەیەنن، ئەوان یارانی ئاگرنو بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە.

(١٨) ڕۆژێك كە خوا هەمویان زیندو دەكاتەوە، جا سوێندی بۆ دەخۆن وەك چۆن لە دنیادا سوێند بۆ ئێوە دەخۆن بەدرۆوەو گومان دەكەن لەسەر شتێكی بەسودن بۆ ئەو ڕۆژەیان، خوا دەفەرموێ: بزانن بێگومان هەر ئەوانن درۆزن، ئەو سوێندە درۆیانە كەدەیخۆن هیچ سودێكیان پێنادات.

(١٩) شەیتان بەسەریاندا زاڵ بوەو رام و دەستەمۆی خۆی كردن، جا یادی خودای لەبیر بردنەوە، ئەوانە پێڕی شەیتانن، بزانن بە بێگومان پێڕی شەیتان هەر خۆیانن كردە سوتاو و ڕەنجەڕۆ، جا پێغەمبەرمان ﷺ یەكێك لە هۆكارەكانی زاڵبونی شەیتانمان بۆ باسدەكاتو دەفەرموێ: {مَا مِنْ ثَلَاثَةٍ فِي قَرْيَةٍ وَلَا بَدْوٍ لَا تُقَامُ فِيهِمْ الصَّلَاةُ إِلَّا قَدْ اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمْ الشَّيْطَانُ فَعَلَيْكَ بِالْجَمَاعَةِ فَإِنَّمَا يَأْكُلُ الذِّئْبُ الْقَاصِيَةَ / النسائي، حسنه الألباني/ هیچ سێ كەسێك نیە نە لە دێهاتێكداو نە لە هیچ ڕەوەندێكدا كە نوێژی تێدا نەكرێت مەگەر شەیتان زاڵبوبێت بەسەریاندا، سا پێویستە لەسەرتان كە یەكبن ئەوسا گورگ ئەو حەیوانە دەخوات كە دوركەوتبێتەوە لە ئاژەڵە كانی تر} .

(٢٠) بێگومان ئەو كەسانەی كە دژایەتی خواو پێغەمبەرەكەی ﷺ دەكەن، ئەوانە وان لەناو سەرشۆڕترینو داماوترین خەڵكاندان.

(٢١) خوا بۆ خۆیو پێغەمبەرەكەی ﷺ وای داناوە كە سەركەوێتو دوژمنانی تەفروتوناو ڕسوا بكات، چونكە بەڕاستی خوا بەهێزو دەسەڵاتدارە بەسەر هەمو شتێكداو لەكاتی دیاری خۆیدا تۆڵە لەدوژمنان وەردەگرێ، راستە اللهُ مۆڵەت دەدات، بەڵام پشتگوێ ناخات (إِنَّ اللهَ يُمْهِلُ وَ لاَيُهْمِلُ).

(٢٢) شتی وا نەگونجاو ڕەوانیە کەسێك کە باوەڕ بە خواو بەڕۆژی دوایی بکاتو دۆستایەتیش بکات لەگەڵ کەسێکدا کە دوژمنایەتی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بکات، ئەگەر چی ئەو گەلە باوکانیان بن یان ڕۆڵەکانیان بن یان براکانیان بن یان عەشیرەتەکانیان بن، جا ئەو کەسەی ئاوا خۆی لە خوانەناسان هەر کەسێکی بن دوور گرتو دۆستایەتی لەگەڵ نەکردن ئەوانەن کە خوا لەناو دڵیاندا باوەڕی جێگیر کردووەو بەهێزی تایبەتی خۆی یارمەتیان دەداتو دەیانخاتە ناو باخاتێکەوە کە چەندین جۆگەی بەناودا دەڕواتو بۆ هەمیشە تێیدان، خودا ڕازیە لەوان بەهۆی ئەو کارە باشانەی کە کردویانەو ئەوانیش ڕازین لەو بەهۆی ئەو هەمو چاکەی لەگەڵیانی کردوە، ئەوانە تاقمو حیزبی خوادنو خۆشبەختن لە هەردوو دنیادا.

ئەم ئایەتە چەند شتێکی گرنگ دەخاتە پێش چاومان،

**یەکەم**: ناگونجێت باوەڕدار لەگەڵ دوژمنانی خواو پێغەمبەردا ﷺ دۆستایەتی هەبێت، ئەگەر بینرا کە موسڵمانێك دۆستایەتی دوژمنانی خواو پێغەمبەری ﷺ دەکات ئەوە ئەو کەسە بێباوەڕە با خۆیشی بە موسڵمان بزانێتو خاوەن نوێژو ڕۆژویش بێت، وەك دەفەرموێ:﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ/ واتە: هەرکەس لە ئێوە ئەوان بکات بەدۆستی خۆی جا بەڕاستی ئەو کەسەش لەوانە ﴾مائیدە/٥١

وەپێغەمبەریشمان ﷺ دەفەرموێ: {لا يُحِبُّ رَجُلٌ قَوماً إلا جَعَلَهُ الله مَعَهُم/احمد، صحجه الألباني/ هەر پیاوێك هەرگەلێکی خۆش بوێت اللہ لەگەڵ ئەوانی دادەنێ }

**دووهەم**: لەم ئایەتەدا باس لە حیزبی خوا دەکات نەك حیزبەکان، چونکە باوەڕداران هەمویان دەبێت یەك ڕیزو یەك حیزب بن بەڵێ جیاوازی بیروڕا لە چوارچێوەی ئاییندا شتێکی ئاساییە بەڵام نابێت هۆکارێك بێت بۆ دووبەرەکی نێوان باوەڕداران، بەڵام بەهۆی دور کەوتنەوەی موسڵمانان لەئایینە بەرزو بەرێزەکەی ئیسلامو لاسایی کردنەوەی بێباوەڕان ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی لێکردوە ڕوی داوە پێغەمبەرمان ﷺ فەرموی: {لَيَأْتِيَنَّ عَلَى أُمَّتِي مَا أَتَى عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ حَذْوَ النَّعْلِ بِالنَّعْلِ وَإِنَّ بَنِي إِسْرَائِيلَ تَفَرَّقَتْ عَلَى ثِنْتَيْنِ وَسَبْعِينَ مِلَّةً وَتَفْتَرِقُ أُمَّتِي عَلَى ثَلَاثٍ وَسَبْعِينَ مِلَّةً كُلُّهُمْ فِي النَّارِ إِلَّا مِلَّةً وَاحِدَةً قَالُوا وَمَنْ هِيَ يَا رَسُولَ اللهِ قَالَ مَا أَنَا عَلَيْهِ وَأَصْحَابِي / الترمذي، حسنه الألباني/ بەدڵنیاییەوە بەسەر ئەم ئومەتەی مندا دێت ئەوەی کەهات بەسەر بەنی ئیسرائیل دا هەروەك تای پێڵاو بۆتای پێڵاو بەبێ جیاوازیو پێ بەپێ، بەڕاستی بەنی ئیسرائیلی بون بەحەفتاو دووبەشەوەو ئومەتی منیش دەبێ بەحەفتاوسێ بەشەوە هەمویان لەناو ئاگردان لەرۆژی قیامەتدا بێجگە لەیەك بەشیان، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێیە ئەو بەشە؟ فەرموی: ئەو کەسەیە کە لەسەر ئەم ڕێبازە بێت کە خۆمو یارەکانمی لەسەرە} لەم فەرمودەیەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: " أُمَّتِي" واتە هەمو ئەوانەی کە خۆیان بە شوێن کەوتوی پێغەمبەر ﷺ دەزاننو پێیشیان وایە کە هەر ئەوان لەسەر حەقنو جگە لەوان ئەهلی ئاگرە ئەمە بیروبۆچونی هەمویانە بەڵام هەر یەك بەش لەو حەفتاو سێ فیرقەیە حەقی پێکاوە کە شوێنکەوتوانی ڕاستەقینەی پێغەمبەر ﷺ و یارەکانییەتیو ئەم ئایەتە لێرەدا بە حیزبی خوا ناوییان دەبات، جا بۆ ئەوەی بزانرێت کامانەن ئەو تاقمە ڕزگارە وا هەندێك لە سیفەتەکانی باس دەکەین:

**یەکەم** ـ ئەوبەشەن کە دۆستایەتیو دژمنایەتیان لەبەر خوایە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {أوْثَقُ عُرَى الإيمانِ المُوَالاةَ في الله والمعاداة في الله والحبُّ في الله والبُغْضُ في الله / الطبراني، صححه الألباني/ بەهێزترین دەستەی ئیمان دۆستایەتی لەبەر خواو دوژمنایەتیە لەبەر خواو خۆشەویستی لەبەر خواو ڕق لێبونەوە لەبەر خوای دەسەڵاتداری گەورەیە}.

وەسفی **دوهەمیان** ـ ئەوبەشەن کە جیهاد دەکەن لە پێناوی اللہ دا، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لَا تَزَالُ طَائِفَةٌ مِنْ أُمَّتِي يُقَاتِلُونَ

لَّا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ يُوَآدُّونَ مَنْ حَآدَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَلَوْ كَانُوٓا۟ ءَابَآءَهُمْ أَوْ أَبْنَآءَهُمْ أَوْ إِخْوَٰنَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ كَتَبَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْإِيمَـٰنَ وَأَيَّدَهُم بِرُوحٍ مِّنْهُ ۖ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۚ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ حِزْبُ ٱللَّهِ ۚ أَلَآ إِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٢٢﴾

## سُورَةُ الحَشْرِ ٥٩ — ٢٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۖ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴿١﴾ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَخْرَجَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ مِن دِيَـٰرِهِمْ لِأَوَّلِ ٱلْحَشْرِ ۚ مَا ظَنَنتُمْ أَن يَخْرُجُوا۟ ۖ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مَّانِعَتُهُمْ حُصُونُهُم مِّنَ ٱللَّهِ فَأَتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِنْ حَيْثُ لَمْ يَحْتَسِبُوا۟ ۖ وَقَذَفَ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلرُّعْبَ ۚ يُخْرِبُونَ بُيُوتَهُم بِأَيْدِيهِمْ وَأَيْدِى ٱلْمُؤْمِنِينَ فَٱعْتَبِرُوا۟ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَبْصَـٰرِ ﴿٢﴾ وَلَوْلَآ أَن كَتَبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمُ ٱلْجَلَآءَ لَعَذَّبَهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ عَذَابُ ٱلنَّارِ ﴿٣﴾

عَلَى الْحَقِّ ظَاهِرِينَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ /البخاري/ هەمیشە بەشێك لەم ئومەتەم بۆدامەزراندنی حەقو راستی کەئاینی پیرۆزی ئیسلامە غەزا دەکەن کە ئاشکراو بالا دەستن هەتا رۆژی قیامەت}

وەسفی **سێهەمو چوارهەمو پێنجەم وشەشەمو حەوتەمیش** لە سورەتی مائیدە ئایەتی پەنجاو چواردا هاتوە کەدەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ٥٤ ﴾ ئەی باوەڕداران هەرکام لەئێوە لەئاینی خۆی پەشیمان ببێتەوە،ئەوسا ئەوەندە نابات خوا گەلێك دێنێ کە خوا خۆشی دەوێن.. ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت.. لەلای باوەڕداران خۆیان بەکەم دەگرن و.. بەعیزەتن دژ بە خوانەناسان.. کە غەزا دەکەن لەرێگای بەرزکردنەوەی ئایینی خواداو لە لۆمەی لۆمە کەران ناترسن﴾

وەسفی **هەشتەمیان**: لەچاکە کاریدا چاو لەخراپەکاری خەڵك ناکەن وەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی: {بَدَأَ الْإِسْلَامُ غَرِيبًا ثُمَّ يَعُودُ غَرِيبًا كَمَا بَدَأَ فَطُوبَى لِلْغُرَبَاءِ قِيلَ يَا رَسُولَ اللهِ وَمَنْ الْغُرَبَاءُ قَالَ الَّذِينَ يُصْلِحُونَ إِذَا فَسَدَ النَّاسُ / السلسلة الصحيحە/ ئیسلام لەسەرەتادا بە غەریبی هاتوە، لەپاشان هەم غەریب دەبێتەوە هەروەك لەسەرەتاوە هاتوە ئەوسا خۆشبەختی بۆ ئەوغەریبانە، بێژرا ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو غەریبانە کێن؟ فەرموی: ئەو کەسانەن کە هەر کاتێ خەڵکی خراپەی کرد ئەوان چاکە دەکەن}
واتە(إِمَّعَة)نین بەرژەوەندیو مەصڵەحەتو واقیع ناکەن بەخوای خۆیانو هاوڕەنگ نابن لەگەل واقیعدا بەڵکو هەوڵدەدەن واقیعی خراپ بگۆڕن،

وەسفی **نۆهەمیان**: ئەوەیە کە دورن لە بەش بەشیو حیزبایەتی، لەسورەتی ئەنعام ئایەتی/سەدوپەنجانۆدا دەفەرموێ:﴿بێگومان ئەو کەسانەی کە ئایینەکەی خۆیان پارچە پارچە کردووە دەستەی لەیەکتر جیاوازیان پێك هێناوە تۆئەی محمد هیچ پەیوەندیەکت بەوانەوە نیە کاری ئەوان هەر لەلای خودایە پاشان پێیان دەڵێت چیان کردوە﴾

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {عَلَيْكُمْ بِالْجَمَاعَةِ وَإِيَّاكُمْ وَالْفُرْقَةَ فَإِنَّ الشَّيْطَانَ مَعَ الْوَاحِدِ وَهُوَ مِنْ الِاثْنَيْنِ أَبْعَدُ مَنْ أَرَادَ بُحْبُوحَةَ الْجَنَّةِ فَلْيَلْزَمْ الْجَمَاعَةَ / الترمذي، صحح الألباني/ واجبی سەرشانتانە کەیەك بن وخۆتان دوربگرن لەبەش بەشی، سا بزانن شەیتان لەگەڵ یەکدایەو لەگەڵ دواندا دورترە، جا هەرکەسێك ناوەڕاستی بەهەشتی دەوێت بابچێتە ریزی ئەو موسڵمانانەوە کەوەك پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی وان}

ئەمە هەندێك بون لە سیفەتەکانی حیزبی خوا، جا ئەوەی کە ئەم سیفەتانەی تێدا بێت ئەوە ئومیدی هەبێت کە لە حیزبی خوادا بێت، ئەگینا قسەی بێکردەوە بێجگە لەزیان هیچ سودێکی نابێ. لەسورەتی بەقەرە ئایەتی دووسەدوهەژدەدا دەفەرموێ: ﴿بێگومان ئەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئەو کەسانەی کە کۆچیان کردووەو غەزایان کردوە لەرێگای خوادا، ئا ئەوانە هیواداری رەحمەتی خودانو بەراستی خوا زۆر لێبوردەو زۆر میهرەبانە﴾

وەلەسورەتی ئەنفال ئایەتی حەفتاوچواردا دەفەرموێ:﴿ ئەو کەسانەی کە باوەڕدارنو کۆچیانکردووەو لەرێگای خوادا غەزایانکردووە ئەوانەش کەجێگایان بەوان داوەو یارمەتیان داون، ئا ئەوانەن بەراستی باوەڕداران بۆ ئەوانە هەیە لێخۆشبون ورۆزییەکی بەرێز﴾.

جا ئەگەر دەتەوێت بزانیت لەو بەشەیت دەتوانیت خۆت تاقی بکەیتەوە بەم شێوەیە: ئەگەر هەموموسڵمانێکت بەبەشێکی خۆت داناو سودو زیانی ئەوت بە هی خۆت زانیو نەت وت: ئەوە لە ئێمەیەو ئەوە لە ئێمە نیەو بەکردار ئەوەت سەلماندو هەروا وەسفەکانی تریشت لەخۆدا بەکردەوە بینا ئەوە راستەکەیت تۆ لەو بەشەیت، ئەگینا راست ناکەیتو تۆ لەو بەشەنیت هەر چەند قسەی قەڵەو نایابیش بکەیت، جا ئەگەر باوەڕت بەقیامەتو حیساب هەیە وفەرمانی خواو پێغەمبەرە کەیت ﷺ بەلاوە راستە دوربکەوە لەو پارچە پارچەییەو نەخۆتو نەخەڵکیش بخەڵەتێنە، بەراستی دەست بگرە بەئایینەکەی خواوەو بگەڕێ بەشوێن ئەوبەشو تاقمەراستەداو پاڵ بدەن بەیەکەوەو یارمەتی ئاینی خودابدەن خوایش یارمەتی ئێوە دەدات﴾ ئەی خاوەن باوەڕان ئەگەر یارمەتی ئایینی خوابدەن خوایش یارمەتی ئێوە دەداتو پێتان بتەو دەکاتو بە دژمنان نابەزن﴾ محمد/٧ .

بەس بخەڵەتێن بە پلەو پارە هەردوو دوایاندێت وسەرەتایان شیرینەو کۆتاییان تاڵە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّكُمْ سَتَحْرِصُونَ عَلَى الْإِمَارَةِ وَسَتَصِيرُ حَسْرَةً وَنَدَامَةً نِعْمَتِ الْمُرْضِعَةُ وَبِئْسَتِ الْفَاطِمَةُ/احمد،النسائي. صحح الالبانى/ بەبێگومان ئێوە زۆر سورن لەسەر ئەمیرایەتی کە زۆر نابات دەبێ بە هۆی خەمو پەشیمانی، شتێکی چاکە شیردەرو ناخۆشە شیر برەوە، سەرەتاکەی خۆشیەو کۆتاییەکەی خەموپەژارەیە}.

٥٩ سورەتی حەشر ٢٤

سورەتی حەشر کە سورەتی پەنجاونۆهەمی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، بیستو چوار ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی نەوەدو هەشتەمە، پاش سورەتی (البينة) و پێش (النصر) لە پاش دەرکردنی (بەنی نەزیر) لە ساڵی چوارەمی کۆچی دابەزیوە. سورەتی (بەنی نەزیر)یشی پێ دەوترێت، چونکە دەربارەی ئەوان هاتوەتە خوارەوە. ئەم سورەتە "منسوخ"ی تیدانیە، بەڵام وتراوە ئایەتی حەوتەمی "ناسخ"ی ئایەتی یەکەمی سورەتی ئەنفالە.

سەعید کوڕی جوبەیر دەڵێت: {قُلْتُ لِابْنِ عَبَّاسٍ سُورَةُ الْحَشْرِ قَالَ قُلْ سُورَةُ النَّضِيرِ/ متفق عليه/ وتم: بە ئیبنوعەباس سورەتی حەشر وتی: بڵێ: سورەتی نەزیر} واتە: ئەم سورەتە لەبارەی جولەکەکانی بەنی نەزیرەوە دابەزیوە. بەنونەزیر کۆمەڵێك بون لە جوەکان کە لە پاش زاڵبونی رۆم بەسەر شامداو کوشتنی زۆرێك لێیان هەندێکیان وەك بەنوقورەیزەو بەنو نەزیر رایانکردو لە دەوروبەری مەدینە نیشتە جێبون، کاتێك پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینە لە گەڵ جولەکەکاندا پەیمانی بەست، جا لەپاش روداوی " بیری مەعونە" کە پاش شەهادەتی دەکەس‌وپاشان پەنجاو نۆ کەسی تر لە یارانی پێغەمبەر شەهید کران، لەو روداوەدا عەمری کوڕی ئومەیەی زەمەری توانی بە سالمی بگەڕێتەوە لە رێگەدا دوو کەسی لە خێڵی "بني عامر " کوشت کە نەیزانی بو ئەوانە لەگەڵ پێغەمبەردا هاوپەیمانن، کاتێك کە گەڕایەوەو پێغەمبەری ﷺ لە روداوەکە ئاگادا کردەوە، پێغەمبەر ﷺ هەوڵیدا کە خوێنی ئەو دوو کوژراوە کۆبکاتەوەو بیدات بە خاوەنی ئەو دوو کوژراوە، جا پێغەمبەر ﷺ لە گەڵ چەند یارێکی بەرو بەنونەزیر کەوتەڕێ تا وەك هاوپەیمانێك داوای یارمەتیان لێ بکات، خۆ کە پێغەمبەر ﷺ گەیشتە ناویان ئەوان لەرواڵەتدا ئامادەیی خۆیان بۆ یارمەتی پێغەمبەر ﷺ دەربڕی، بەڵام ئەوان لەژێرەوە خەریکی پیلانێکی گلاوبون دژ بە پێغەمبەر ﷺ و ئەم کاتەیان بەهەلێکی باش زانی کە پێغەمبەر ﷺ بکوژن،جا " عمر بن جحاش" وتی: ئەوە من دەچمە سەر ماڵەکەوەو لەوێ بەرداشێك دەدەم بە سەریدا. جا اللَّهُ ﷻ پێغەمبەری ﷺ لەو پیلانە ئاگادار کردەوە، ئیتر پێغەمبەر ﷺ بەبێ ئەوەی کە شتێك بڵێت هەڵساو یەکسەر بەرەو مەدینە گەڕایەوە، جا پێغەمبەر ﷺ " مُحَمَّد بن مسلمة"ی رەوانەکرد بۆ ناویان تا پێیان راگەیەنێت بە هۆی ئەو پەیمان شکاندنو خیانەتەیان دەبێ مەدینە بەجێ بهێڵنو دە رۆژ ماوەی پێدان کە لە پاش ئەو دەرۆژە هەرکەس بمێنێت لێیدەدرێت. بەڵام "ابن أُبي " پەیامی بۆناردن کە ئێوە قەڵا گەلێکی گەورەتان هەیەو منیش بە دوو هەرزا چەکدارەوە ئامادەم کە یارمەتیتان بدەینو جولەکەکانی تری غەتەفانیش یارمەتیتان دەدەن، جا لەشوێنی خۆتاندا بمێنێنەوە، ئەوانیش تەماع گرتنیو دەرنەچونو خۆیان بۆ شەڕکردن لە گەڵ پێغەمبەردا ئامادەکرد. جا پێغەمبەر " ئیبنو ئومی مەکتوم " ی لە مەدینە لەجێی خۆی داناو ئاڵای بەدەست عەلی کوڕی ئەبو تالبەوە داو بەرەو بەنو نەزیر کەوتەڕێ، ئەوسا پێغەمبەر ﷺ گەمارۆی دانو چەنددار خورمایەکی بەرچاوی بڕین، ئەوانیش کە بەڵێنی یارمەتیان دابو بە بەنونەزیر درۆیان لەگەڵ کردنو نەهاتن بەدەمیانەوە، ئەوانیش پاش ئەوەی کە زانیان هیچیان پێناکرێت وتیان: بە پێغەمبەر ﷺ کە دەردەچین، بەڵام پێغەمبەر ﷺ قەبوڵی نەکرد، پاشان پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمون: دەربچنو خوێنی خۆتان بۆخۆتانو لە ماڵەکانیشتان تەنها باری حوشترێکتان بۆ هەیە کە ببیەن کە چەكو پۆشاکی جەنگی تێدا نەبێ، جا ئەوان ئەوەی کە بۆیان کرا لە باری حوشترێك بردیان ئەوەش کە پێیان نەدەبرا بۆئەوەی دەستی موسڵمانان نەکەوێت بەدەستی خۆیان دەیان شکاندو لە ناویان دەبرد، ئەم رو داوە لە "ربيع الأول "ی ساڵی چوارەمی کۆچی روی دا بۆ ماوەی پانزە رۆژ پێغەمبەر گەمارۆی قەڵاکانی دانو لە لەم غەزایەشدا ماڵێکی زۆر بەدەست موسڵمانان کەوتو پاڵەوانی بەناوبانگی بەنونەزیر "عزوك" بە دەستی عەلی کوڕی ئەبوتالب کوژراو لەم خێڵە تەنها دووکەس موسڵمان بوون: "يامين بن عمير بن كعب" وە "أبو سعد بن وهب" . وە ئەم سورەتە لە سەر ئەم روداوە باس دەکات.

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەوانەی کە لەناو ئاسمانەکانو لەناو زەویدان هەر پاکیو بێ عەیبی خودایان یاد کردوەو هەر خۆیەتی دەسەڵاتدارو دانا.

(٢) خوا ئەو زاتەیە کە خوانەناسانی خاوەنانی پەڕاو (بەنی نەزیر)ی لە جێگای خۆیاندا دەرپەڕاند (بەهۆی لاساریو پەیمان شکاندنی خۆیانەوە) لەکاتی یەکەم دەرکردنیاندا ئێوە گومانتان نەدەکرد کە ئەوان دەرچنو ئەوانیش وایان دەزانی کە کۆشکەکانیان لەدەست تۆڵەی خودا دەریان دەکاتو دەیانپارێزێت، جا خودا بەشێوەیەك هاتە سەریان کە هەرگیز خۆیان گومانیان نەدەکردو ترسی فڕەدایە ناو دڵیانەوە، کە بە دەستی خۆیانو بەدەستی خواناسان ماڵەکانی خۆیانیان وێران کرد، سا ئێوەیش ئەی خاوەن دیدو بۆچونە وردەکان لەم بەسەرهاتە پەندو ئامۆژگاری وەربگرنو لە تۆڵەی خودا بترسن، خودا سەربازی زۆرەو رێگای تۆڵە سەندنەوەی لێ ناگیرێت.

ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ شَآقُّواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥۖ وَمَن يُشَآقِّ ٱللَّهَ فَإِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٤﴾ مَا قَطَعْتُم مِّن لِّينَةٍ أَوْ تَرَكْتُمُوهَا قَآئِمَةً عَلَىٰٓ أُصُولِهَا فَبِإِذْنِ ٱللَّهِ وَلِيُخْزِىَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾ وَمَآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْهُمْ فَمَآ أَوْجَفْتُمْ عَلَيْهِ مِنْ خَيْلٍ وَلَا رِكَابٍ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يُسَلِّطُ رُسُلَهُۥ عَلَىٰ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٦﴾ مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴿٧﴾ لِلْفُقَرَآءِ ٱلْمُهَٰجِرِينَ ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمْ وَأَمْوَٰلِهِمْ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنًا وَيَنصُرُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ﴿٨﴾ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُواْ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾

﴿٣﴾ ئەگەر خوا ئەو دەرچونەی لەسەر ئەوان پێشتر تۆمارنەکردایە، بە دڵنیاییەوە هەر لە دنیادا سزای دەدان و لە ڕۆژی دوایشدا سزای ئاگریان هەیە، ئەم تاقمە جولەکە پاش شەش مانگ لە دوای بەدر بەهۆی خیانەتی خۆیانەوە دەرکران و ماوەیان پێدرا، جگە لە شمشێر هەرسێ کەس باری وشترێك کەل‌وپەلّ لەگەڵ خۆیاندا دەربکەن و بڕۆن.

﴿٤﴾ بۆیە ئەوەیان بەسەرهات، چونکە ئەوان بەڕاستی دژایەتی توندی خوداو پێغەمبەرەکەیان ﷺ کردو هەر کەسێکیش دژایەتی خودا بکات، ئەوسا بزانن بێگومان کە خوا تۆڵەی زۆر سەختەو تۆڵەیان هەر ئاوەها لێ وەردەگرێت. جاکاتێ کەپێغەمبەر ﷺ فەرمانی بڕین وسوتاندنی خورمای ناوچەی(بوەیرەی)دا تا نائومێدیان بکات لەباخەکانیان و شەڕی لەسەر نەکەن، دیارە ئەوە دەمی مونافقو جولەکەکانی کردەوە بۆ قسەی ناشیرین کردن ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی ترەوە ئەو موسڵمانانەی کە فەرمانی بڕینی ئەودار خورمانەیان بەسەرا درابو شتێك بوە لەناو دڵیانداو وتیان: لەپێغەمبەر ﷺ پرسیار دەکەین: ئایا لەسەر ئەوەی کەبڕیومانە پاداشمان هەیە و لەسەر ئەوەی کە نەمان بڕیوە تاوانمان لەسەرە؟ جا ﷻ ئەم ئایەتەی نارد کە دەفەرموێ:

﴿٥﴾هەر دارخورمایەکتان بڕیوە یان وازتان لێ هێنا کە لەسەر بنی خۆی بمێنێتەوەو نەتانبڕیوە، ئەوسا هەمووی بە ئیزنی خودایە و شتی خراپتان نەکردوەو بۆ ئەوەیە کە خوا سنوربەزێنان سەرشۆڕ بکات و بەبێ شەڕ ناوچەکە چۆڵ بکەن.

﴿٦﴾ ئەوەی کە خودا داوێتی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ لە سەروەت و سامانی خوانەناسانی دەوروبەری، بەبێ ئەوەی کە ئێوە چارەوێ و سواری تێدا ماندو بکەن بەڵام خودا خۆی پێغەمبەرەکەی ﷺ زاڵ دەکات بەسەر ئەو کەسەی کە ئارەزوی لێبێت و خودا توانای هەیە بەسەر هەمو شتێکداو هیچ شتێك ناتوانێت ڕێگای ئارەزوی ئەو زاتە بگرێت.

﴿٧﴾ ئەو سامانەی کە خوا ئا بەو شێوەیە کە لە پێشدا وترا گەڕاندیەوە بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەمە ماڵی خوایەو دەدرێت بەم پێنج تاقمە: بۆ پێغەمبەر ﷺ و بۆ بەرەی عەبدولموتەلیب و بەرەی هاشمە لە خزمانی پێغەمبەرو بۆ هەتیوانەو بۆ هەژارو کەمدەستەکانەو بۆ ئەو ڕێبوارانەیە کە لە ڕێگادا پارەیان پێ نامێنێت، خوا ئەو ماڵە ئاوەها بڵاودەکاتەوە بۆ ئەوەی ئەو ماڵانە لەنێوان سەروەتمەنداندا کۆ نەبێتەوە واتە: ئیسلام سەرمایەداری پێخۆش نیە بەڵام قەدەغەی نەکردوە، چونکە بەدرێژایی مێژو هەر سەرمایەداران بون کە دژایەتی پێغەمبەران و پیاو چاکانیان کردوەو دەیکەن و بەهۆی ئەو سەروەت و سامانەوە خراپەو تاوانیان لەسەر زەویدا بڵاوکردوەتەوە، ئیسلام بەپەیڕەوی کردنی گۆڕانکاری دروست دەکات، جا ئەوانەی کە سەرمایەداران و پلەوپایەدارن نایانەوێ هیچ گۆڕانکاریەك ڕوبدات لەبەر ئەوە دژ بەئیسلام ڕادەوستن، ئیسلام ڕێگایەکی داناوە ماوە نادات کە سەروەت و سامان تەنها لەناو یەك کۆمەڵی تایبەتدا ئەم دەست و ئەودەست بکات، چونکە زۆری ماڵ هۆکارێکە بۆئەوەی کە مرۆڤ لە سنوری خۆی دەرچێت، هەروەك لە سورەتی شورا ئایەتی/بیس‌وحەوت دا دەفەرموێ: ﴿ئەگەر خوا ڕۆزی فرەوان بکات بۆ بەندەکانی ئەوە بە دڵنیاییەوە خراپەکاری دەکەن لەناو زەویدا﴾

تەنانەت پێغەمبەر پێش هەمو کەس ئەو بەرنامەیەی بەسەری خۆیدا ئەنجام داوە زەکاتی نەخواردوە فەرمویەتی: {زەکات حەرامە لەسەر محمدو ئالی محمد}وە دەفەرموێ: {ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران ئیرسمان لێ نابرێت، ئەوەی کەلێمان بە جێ دەمێنێت ماڵی موسڵمانانە} جا ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ پێتان دەدات لەوماڵە ئێوەیش وەریبگرن و ئەوەیشی کە بەرگری دەکات لێتان ئێوەیش وازی لێ بهێنن و لە خوا بترسن، بێگومان خودا تۆڵەی زۆر سەختە. ئەم ئایەتە گەورەیی سونەتی پێغەمبەرمان ﷺ پیشان دەدات و دەوامان لێدەکات ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێدەدات بەجێی بهێنین و ئەوەی کە قەدەغەی کردوە وازی لێ بهێنین، دیسان ئەم ئایەتە دەمکوتێکە

بۆئەوكەسەی كە بڵێت من گوێڕایەڵی ﷲ دەكەم و ئەوەی كەلە قورئاندا هاتبێت ئەنجامی دەدەم، بەڵام گوێ بە فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ نادەم، واتە: قورئانم بەسە، راستە قورئان بەسە بەڵام بۆ ئەوكەسەی كە گوێڕایەڵی هەموو ئایەتەكانی بێت، جا هەر قورئانیشە كە فەرمانمان پێدەكات كەگوێڕایەڵی سونەتی پێغەمبەر بین، دەی چۆن دەگونجێت بوترێت گوێڕایەڵی قورئان دەكەم بەڵام بەگوێی فلان ئایەتو فلان ئایەت ناكەم؟! بەڵێ ئەم بیروبۆچونانە ئەمڕۆ هەیە كە خۆی بەڵگەیەكە بۆ راستی سونەتی پێغەمبەرەكەمان ﷺ چونكە ئەو پێغەمبەرە ﷺ باس لەمانە دەكاتو دەفەرموێ: { أَلَا إِنِّ أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ أَلَا يُوشِكُ رَجُلٌ شَبْعَانُ عَلَى أَرِيكَتِهِ يَقُولُ عَلَيْكُمْ بِهَذَا الْقُرْآنِ فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَلَالٍ فَأَحِلُّوهُ وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهِ مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ/ ابوداود، أحمد، صححه الألباني/ ئاگاداربن كە من قورئان و لەگەل ئەو قورئانەشدا وەك ئەوقورئانەشم پێدراوە، ئاگاداربن نزیكە پیاوێكی تێرو سك پڕ پاڵبداتەوەو بڵێت: ئێوە تەنها ئەم قورئانە بگرن، جا چیتان دەستكەوت تێیدا لە حەڵاڵ ئێوەش بەحەڵاڵی بزانن‌و چیتان دەستكەوت لە حەرام ئێوەش بەحەرامی بزانن} واتە گوێ بەفەرمودەكانی پێغەمبەرﷺ مەدەن، بەڵام ﷲ دەفەرموێ:

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ﴾ / ئەوەی كە گوێڕایەڵی پێغەمبەر ﷺ دەكات بەحەقیقەت ئەوە گوێڕایەڵی ﷲ ی كردوە ﴾ نیسا/٨٠.

وە ئەوەی كە بیبەوێت لە قورئان تێبگات بە بێ كەڵك وەرگرتن لە فەرمودەكانی پێغەمبەر ﷺ بەدڵنیاییەوە كە ئەوكەسە رێگای ون كردوەو بەرەو رێگای شەیتان كەوتوەتەڕێ، جا ئەوانە كە ئاوان ئایا دەتوانن نوێژێكی قورئانی بخوێنن بەچی دەست پێدەكەن‌و چۆن دوای دەهێنن؟ چەند رەكاتەو چەند سوجدەو چەند روكوع دەبەن؟ یان دەبێت بڵێن ئەوەڵ سوجدە دەبەین پاشان ركوع دەبەین چونكە قورئان سوجدەی پێش ركوع داناوەو دەفەرموێ: ﴿ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴾ (٤٣) ﴾ آل عمران.

یان ﷲ فەرمان دەدات كە زەكات بدەین، جا لەچی بیدەین و چەندی بدەین؟ وە یان سەدەها پرسیاری تركە ئەگەر گەڕانەوە بۆ سونەت نەبێت هیچ وەڵامێكیان بۆ نیە.

وە پێویستە بزانین پێغەمبەر هیچ خەیرو چاكەیەك نیە مەگەر ئەوەی بە ئومەتەكەی گەیاندبێ وەك خۆی دەفەرموێ: {إِنَّهُ لَيْسَ شَيْءٌ يُقَرِّبُكُمْ إِلَى الجَنَّةِ إِلَّا قَدْ أَمَرْتُكُمْ بِهِ وَلَيْسَ شَيْءٌ يُقَرِّبُكُمْ إِلَى النَّارِ إِلاَّ قَدْ نَهَيْتُكُمْ عَنْهُ/ السلسلة الصححة/ هیچ شتێك نیە كە لە بەهەشتەوە نزیكتان بكاتەوە مەگەر ئەوەی كە بەو فەرمانم پێكردون‌و هیچ شتێكیش نیە كە لە ئاگر نزیكتان بكاتەوە مەگەر ئەوەی كە ئێوەم لەوە بەرگری كردوە} جا ئەوەی كە بیدعەتێك دەهێنێتو بەچاكیشی دادەنێتو چاكیش دەزانێت كە پێغەمبەر ﷺ بەوە فەرمانی نەداوە چی دەڵێت لە بەرامبەر ئەم فەرمودەیەدا؟ ئەو كەسە لە دوو حاڵ دەرناچێت یان پێی وایە ئەو ئیشەی كە پێی چاكەو پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی پێنەداوە بە هۆی بێ ئاگای پێغەمبەر ﷺ بوە لەو ئیشە چاكو خەیرە، یان پێی وایە پێغەمبەر ﷺ بێ ئاگا نەبوە بەڵام شاردویەتیەوەو بە ئومەتەكی رانەگەیاندوە ! ئاشكرایە كە هەردوو لاكەی تاوانە دەی با ئەم كۆمەڵە بیدعەچیە كە لە كەمتەرخەمیدا ئەو پەڕیانگرتوەو ئەوانەی كە بەناوی قورئان بەسەو ناوی قورئانیەكانیان لە خۆی ناوە تەوبە بكەن‌و ئەم ئایەتە بكەن بە رێبازی خۆیان، دڵنیابن ئەگەر بەراستیو خەمخۆرییەوە پەیڕەوی بكەن رێگای راست دەدۆزنەوە.

من خۆم جارێك لەگەل سێ كەس لەو برادەرانە قسەم كرد كەكاتی نوێژی نیوەڕۆ بو بانگدرا وتم: بەقسەی ئێوە ئێمە وابانگدرا چی بكەین؟ وتیان: نوێژ دەكەین وتم: چەند ركات بكەین‌و چەند سوجدە وركوع تەحیاتە؟ یەكێكیان وتی: هەرچۆنمان خوێندوە هەروا دەی خوێنین وتم: من تا ئیستا لەقورئاندا نەمدیوە كە ئەوانەی باسكردبێ وەك دەیخوێنین، جا رویان لەبرا سەركردەكەیان كەناوی كمال بوكردو چاوەڕوانی وەڵامیان لێكرد سوپاس بۆ خوا مەسئولیەت نەیتوانی ئەوبرایە فریوی بداتو بەراستی وەڵامی داناوە كە بەڵێ مامۆستا راست دەكات، جا لەو هەڵەیە وازیان هێناو بنكەو بارەگایان پێچایەوەو راگەیەنراوێكیشیان بلاو كردەوەو نوسخەیەكیشیان بۆهێنامو هەندێ لەو تاوانانەیشی بۆباسكردم كە سەركردەی گەورەیان بەوناوەوە ئەنجامی دابو، ئینجا هەریەكەیان چو بەدەم كاری خۆیەوە، خواسەقامگیرتریان بكات لەسەر ئایینی خۆیو باقی هاوشێوەكانشیان رینمایی بفەرموێ.

ئیبنو مەسعود لەپێغەمبەری خوا ﷺ وە هێناویەتی كەدەڵێ: {لَعَنَ ﷲ الْوَاشِمَاتِ وَالْمُسْتَوْشِمَاتِ وَالْمُتَنَمِّصَاتِ وَالْمُتَفَلِّجَاتِ لِلْحُسْنِ الْمُغَيِّرَاتِ خَلْقَ ﷲ تَعَالَى مَالِي لَا أَلْعَنُ مَنْ لَعَنَ النَّبِيُّ ﷺ وَهُوَ فِي كِتَابِ ﷲ وَمَا آتَاكُمْ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ/البخاري/ خوا لەعنەتی كردوە لەو ئافرەتانەی كە خاڵ دەكوتن‌و خاڵیان بۆ دەكوترێتو برۆیان هەڵدەگرن‌ودانیان باریك دەكەنەوە بۆجوانی كە دروستكراوی خوای بالادەست دەگۆڕن، بۆ دەبێ لەعنەت نەكەم لەو ئافرەتەی كە پێغەمبەر ﷺ لەعنەتی لێدەكات لەحاڵێكدا كە ئەوە لە قورئاندایە ﴿ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ پێتان دەدات وەری بگرن‌و ئەوەی كە بەرگریتان لێدەكات مەیكەن﴾ پێغەمبەر ﷺ بەرگری

وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾ ۞ أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ نَافَقُواْ يَقُولُونَ لِإِخۡوَٰنِهِمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ لَئِنۡ أُخۡرِجۡتُمۡ لَنَخۡرُجَنَّ مَعَكُمۡ وَلَا نُطِيعُ فِيكُمۡ أَحَدًا أَبَدٗا وَإِن قُوتِلۡتُمۡ لَنَنصُرَنَّكُمۡ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّهُمۡ لَكَٰذِبُونَ ﴿١١﴾ لَئِنۡ أُخۡرِجُواْ لَا يَخۡرُجُونَ مَعَهُمۡ وَلَئِن قُوتِلُواْ لَا يَنصُرُونَهُمۡ وَلَئِن نَّصَرُوهُمۡ لَيُوَلُّنَّ ٱلۡأَدۡبَٰرَ ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١٢﴾ لَأَنتُمۡ أَشَدُّ رَهۡبَةٗ فِي صُدُورِهِم مِّنَ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَفۡقَهُونَ ﴿١٣﴾ لَا يُقَٰتِلُونَكُمۡ جَمِيعًا إِلَّا فِي قُرٗى مُّحَصَّنَةٍ أَوۡ مِن وَرَآءِ جُدُرِۭۚ بَأۡسُهُم بَيۡنَهُمۡ شَدِيدٞۚ تَحۡسَبُهُمۡ جَمِيعٗا وَقُلُوبُهُمۡ شَتَّىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴿١٤﴾ كَمَثَلِ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَرِيبٗاۖ ذَاقُواْ وَبَالَ أَمۡرِهِمۡ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١٥﴾ كَمَثَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ إِذۡ قَالَ لِلۡإِنسَٰنِ ٱكۡفُرۡ فَلَمَّا كَفَرَ قَالَ إِنِّي بَرِيٓءٞ مِّنكَ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿١٦﴾

کردوه لەوانە} ئینجا دەچینەوە سەر مانای ئایەتی پاش کە دەفەرموێ:

﴿٨﴾ لەم ماڵە دەدرێت بەو موسڵمانە کۆچەرییە هەژارانەی کە لە ماڵو سەروەتو سامانی خۆیاندا دەرکراون لەمەکەوە بۆمەدینە کە خێرو چاکەو ڕەزامەندی خوایان دەوێتو یارمەتی ئاینی ئیسلامو پێغەمبەری خوا ﷺ دەدەن، ئائەوانە هەر خۆیانن ڕاستگۆیان. بەڕاستی ڕاستوڕاستگۆو گیان فیدابون بۆ سەقامگیر کردنی ئاڵای ئیسلام(خوالەهەمویان ڕازی بێ)و نەفرینی خوایش لەناحەزانیان بێ .

﴿٩﴾ جا لەم ماڵەیش دەدرێت بەو موسڵمانانەی مەدینە کە ماڵو بیرو باوەڕیان ئامادەکردوە پێش ئەوەی کە موسڵمانان کۆچ بکەن بۆ لایان، خۆ ئەو کەسانەشیان خۆشدەوێت کەکۆچیان کردوە بۆلایانو بە دڵیش ئیرەیی نابەن بەوەی کە دراوە بەوان لەو دەستکەوتە، هەمیشە لە خۆشی ژیانو سەروەتو ساماندا ئەوان لەپێش خۆیاندا دادەنێن، هەرچەند خۆیشیان پێویستیان بەو شتە هەبێت، جا هەر کەسێك خۆی بپارێزێت لە ڕژدی، ئەوسا هەر ئەوانن ڕزگاربووان. لە ئەبو هورەیرەوە هاتوەکە: {أَنَّ رَجُلًا أَتَى النَّب ﷺ فَبَعَثَ إِلَى نِسَائِهِ فَقُلْنَ مَا مَعَنَا إِلَّا الْمَاءُ فَقَالَ رَسُولُ الله ﷺ مَنْ يَضُمُّ أَوْ يُضِيفُ هَذَا فَقَالَ رَجُلٌ مِنْ الْأَنْصَارِ أَنَا فَانْطَلَقَ بِهِ إِلَى امْرَأَتِهِ فَقَالَ أَكْرِمِي ضَيْفَ رَسُولِ الله ﷺفَقَالَتْ مَا عِنْدَنَا إِلَّا قُوتُ صِبْيَانِي فَقَالَ هَيِّئِي طَعَامَكِ وَأَصْبِحِي سِرَاجَكِ وَنَوِّمِي صِبْيَانَكِ إِذَا أَرَادُوا عَشَاءً فَهَيَّأَتْ طَعَامَهَا وَأَصْبَحَتْ سِرَاجَهَا وَنَوَّمَتْ صِبْيَانَهَا ثُمَّ قَامَتْ كَأَنَّهَا تُصْلِحُ سِرَاجَهَا فَأَطْفَأَتْهُ فَجَعَلَا يُرِيَانِهِ أَنَّهُمَا يَأْكُلَانِ فَبَاتَا طَاوِيَيْنِ فَلَمَّا أَصْبَحَ غَدَا إِلَى رَسُولِ الله ﷺ فَقَالَ ضَحِكَ الله اللَّيْلَةَ أَوْ عَجِبَ مِنْ فَعَالِكُمَا فَأَنْزَلَ الله وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمْ الْمُفْلِحُونَ / البخاري وغيره / جارێکیان پێغەمبەرمان ﷺ میوانێکی بۆ هاتو ناردیە ماڵەوە بزانێت چیان هەیە ؟ خێزانەکانی وتیان: تەنها ئاومان هەیە، فەرموی: کێ ئەم میوانەی پێغەمبەر ﷺ دەباتەوە بۆ ماڵی خۆی؟ یەکێك لە یارەکانی یاریدەدەر(الانصار) وتی: من، جامیوانەکەی بردەوە ماڵەوەو بە خێزانەکەی وت: ئەمە میوانی پێغەمبەرە ﷺ ڕێزی لێ بگرە، خێزانەکەی وتی: تەنها خواردنی منداڵەکانمان هەیە، وتی: خواردنەکە ئامادە بکەو چراکەت چاك بکە ومنداڵەکان بخەوێنە، جا کاتێك کە کاتی خواردن هات نانی ئامادە کردو منداڵەکانی خەواند ئەوسا بەناوی چرا چاك کردنەوەچراکەی کوژاندەوەو خواردنەکەی هێنا بۆی، خۆیان واپیشان دەدا کە گوایە ئەوانیش نان دەخۆنو سکی خۆیان ئەو شەوە شەتەك داو منداڵەکانیان بە برسی سەریان نایەوە، بەیانی پێغەمبەر ﷺ فەرموی: خوا پێکەنی یان تەعەجوبی کرد لەو کارەتانو ئەم ئایەتەی دابەزاند ﴿وَيُؤۡثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ وَلَوۡ كَانَ بِهِمۡ خَصَاصَةٞ﴾}

﴿٨﴾ جا هەروەها ئەو دەستکەوتە بۆ ئەو کەسانەشە کە پاش ئەوان (المهاجرين و الأنصار) هاتونو دەڵێن: ئەی پەروەردگارمان لێمان ببورەو لەو برایانەیشمان کە لەپێش ئێمەدا بوون، ساهەرگیز لەناو دڵماندا کینەیەك دامەنێ سەبارەت بەو کەسانەی کە باوەڕیان هێناوە، ئەی پەروەردگارمان بێگومان کە تۆ دڵسۆزو میهرەبانیت سەربارەت بە بەندەکانت. ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتە دەکات بە بەڵگە لەسەر ئەوەی که شیعە ئەگەر لە جیهادیشدا بەشداری بکەن نابێت لە دەستکەوتی غەزا هیچیان پێبدرێت، چونکە نە مهاجرنو نە ئەنسارنو نە ئەوانەشن کە دوعای خێر بۆ ئەو باوەڕدارانەی پێش خۆیان دەکەن، ئەمە سەرەڕای ئەوەش کە هەر چوار مەزهەب شیعە بە کافر دادەنێن، چونکە لەڕاستیدا شیعە نەك ئایینیان لەلای خەڵك زانراو نیە بەڵکوخۆیشیان نازانن ئایینیان چیە، چونکە ئەوان بەلایانەوە وایە کە قورئانی ئەوان چەند بەرامبەری ئەم قورئانەی ئێمەیەو لە چاڵی سامەڕا لەلای ئیمام زەمانیانەو یەك پیتی ئەم قورئانەیشی تێدانیەو بە زمانی عیبریشە نەك عەرەبی؟! دەی ئەوە نزیکەی هەزارو چوار سەد ساڵە بەسەر دروستبونی ئەواندا تێدەپەڕێت، جا با بزانین کامیان

شتێکی گرنگ لەو قورئانەیان دەزانێت؟ ئەگەر خاوەنی ژیرین و بەڕاستی دەتانەوێت دینداری بکەن و خۆتان لەخواوە نزیك بکەنەوە بۆ پرسیار ناکەن کامەیە ڕێبازمان؟ ئەم دینەتان لەکوێ هێناوە؟ لەعوروەوە لە خاتون عائیشەی دایکی ئیماندارانەوە هێناویەتی کە وتی: {يَا ابْنَ أُخْتِي أُمِرُوا أَنْ يَسْتَغْفِرُوا لِأَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فَسَبُّوهُمْ /مسلم/ ئەی کوڕی خوشکم فەرمانیان پێکراوە کە داوای لێخۆشبون بکەن بۆیارانی پێغەمبەر ﷺ کەچی جنێویان پێدەدەن!} دەچینەوە سەر مانای ئایەتەکانی تری ئەم سورەتە پیرۆزە کە دەفەرموێ:

(١١) ئایا تۆ تەماشای ئەو کەسانە ناکەیت کە دووڕووبون بە هاوشێوەکانی خۆیان (ئەوانەی کە خوانەناس بون لە ئەهلی کتێب) دەیان وت: ئەگەر ئێوە دەرکران بەخوا ئێمەیش لەگەڵتاندا دەردەچین و هەرگیز لە دژی ئێوە پەیڕەوی لە کەس ناکەین و ئەگەر شەڕشتان لەگەڵ کرا بەخوا یارمەتیتان دەدەین، وە خوا شایەتی دەدات کە بێگومان ئەوانە درۆزنن،

(١٢) بە خوا ئەگەر دەرکرێن لەگەڵیاندا دەرناچن، بێگومان ئەگەر شەڕشیان لەگەڵدا بکرێت لەسەریان ناکەنەوەونایەن بەدەمیانەوە و ئەگەر یارمەتیشیان بدەن بێگومان پشتیان تێدەکەن و ڕادەکەن، پاشان کەس بەهانایانەوە نایەت و لەسەریان ناکاتەوە، ئیتر چۆن درۆزن نین؟ جا خوا دەفەرموێ:

(١٣) بێگومان ئەوان دڵیان لە ئێوە زیاتر دەترسێت تا خودا ئەوەش لەبەر ئەوەیە کە گەلێکن لە هیچ تێناگەن، ئەگینا چۆن دەبێت لەو زاتە ئاگادارو بەهێزە نەترسن بەڵام لە ئێوە بترسن؟! بەڕاستی خوانەناسان هێزیان لەچاویاندایە ئەگەر خاوەنی هێز بیت ئەوان جورئەتی ڕوبەڕوبونەوەیان نیە وەك دەفەرموێ:

(١٤) ئەوان هەمویان شەڕتان لەگەڵدا ناکەن بەیەکەوە، مەگەر لەناو ئەو جێگایانەدا بن کە بەهۆی هێزو چەکەوە پارێزراو بێت یان لەپشتی دیوارەکانەوە، ناکۆکی زۆر توند لەنێوان خۆیاندا هەیە، تۆ وا دەزانی یەکن لەحاڵێکدا کە دڵەکانیان لەیەك جیایە، چونکە ئەوانە بێگومان گەلێکن نەفام. ئەی باوەڕداران بیربکەنەوە بزانن ئێمە ئەم گەلە نەفامەنین؟ بەڕۆڵەت هەموی خۆی بە موسڵمان دادەنێت و دروشمیشی خودا پەرستیە، کەچی لە کردارو لەناو دڵدا هەریەکەی گیایی باسکێك دەخوات و هەریەك بۆرەوریبازو ڕێچکەیەك خۆی ماندو دەکات؟! دنیا دوایی دێت بیربکەنەوە، با قیامەتیش لەدەست نەدەین، ئەوە بەرهەمی حیزبایەتیە بۆگەنەکەی ناو ئوممەتی ئیسلامیە لەم سەردەمەدا کە موسڵمانانی سەرشۆڕو زەلیل کردوە، بیربکەنەوە، خۆپەسەندی و نەفامی تا کەی، ئەی بەناوڕۆشنبیر! زۆرعەیبە

فَكَانَ عَٰقِبَتَهُمَآ أَنَّهُمَا فِي ٱلنَّارِ خَٰلِدَيۡنِ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٧﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَلۡتَنظُرۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ لِغَدٖۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿١٨﴾ وَلَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ نَسُواْ ٱللَّهَ فَأَنسَىٰهُمۡ أَنفُسَهُمۡۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿١٩﴾ لَا يَسۡتَوِيٓ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ وَأَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِۚ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَنَّةِ هُمُ ٱلۡفَآئِزُونَ ﴿٢٠﴾ لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِۖ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٢٢﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلَّذِي لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡمَلِكُ ٱلۡقُدُّوسُ ٱلسَّلَٰمُ ٱلۡمُؤۡمِنُ ٱلۡمُهَيۡمِنُ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡجَبَّارُ ٱلۡمُتَكَبِّرُۚ سُبۡحَٰنَ ٱللَّهِ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ﴿٢٣﴾ هُوَ ٱللَّهُ ٱلۡخَٰلِقُ ٱلۡبَارِئُ ٱلۡمُصَوِّرُۖ لَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ يُسَبِّحُ لَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢٤﴾

سُورَةُ المُمْتَحَنَة ٦٠ ١٣

نەفامی؛خواناسی عەمەلە بەوەی کە لە خواو پێغەمبەرەکەیەوە ﷺ هاتوە نەقسەی ساف ولوس؟!

(١٥) وەکو ئەو کەسانەی کەمێك پێش خۆیانن کە تۆڵەی کارە خراپەکانی خۆیان چەشت، مەبەستی کوژرانی بەدرە، وە سزای بەژانیشیان بۆ هەیە لەقیامەتیشدا.

(١٦) وێنەی ئەم مونافقانە لەو بەڵێنانەی کە دەیدەن بە خوانەناسان هەروەکو کاری شەیتان وایە ئەو کاتەی کە وتی: بە مرۆڤ خودا مەناسە، جا کاتێك بەگوێی کردو خودای نەناسی شەیتان وتی: بێگومان من هیچ پەیوەندیەکم بە تۆوە نیە، بێگومان کە من لە خودای جیهانیان دەترسم، بەڵام ئەم دورە پەرێزیەی شەیتان لەو کابرایەی کە خەڵەتاندویەتی سوودێکیش بە شەیتان نادات و هەردووك بە سزای کاری خۆیان دەگەن وەك دەفەرموێ:

(١٧)ئەوسا سەر ئەنجامیان ئەوەیە کە هەردووکیان بێگومان بۆ هەمیشە لەناو ئاگردان و ئەوەش سزای ستەمکارانە لەهەمو کات وساتێکدا.

(١٨) ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن، جا با هەر کەسێك تەماشا بکات و بزانێت چی پێش خستوە بۆ بەیانی و لە خوا بترسن، بەبێگومان کەخوا زۆر ئاگادارە بەو شتانەی کە دەیکەن. بەڵێ خوا هیچی لێ ون نابێت و دادپەروەرە لە تۆڵەو

سزادا، لێرەوە دەردەکەوێت کەپارێزکاری چەندە گرنگە لە لای خوا کە هەرلەم ئایەتەدا دووجار فەرمانی پێکراوە چونکە پەرهیزکاران دەرگای خۆشبەختیان لێدەکرێتەوەو سەربەرزو سەرفەرازن لەهەردوو ژیاندا .

(١٩) ئێوە وەکو ئەو کەسانە مەبن کە خوایان لە بیرچویەوە، ئەوسا خوداش وای بەسەر هێنان کە خۆیشیان لە بیر بباتەوەو ئیتر هیچ ئیشێکی باشیان بۆ خۆیانو ڕۆژی دوایی پێش نەخست، ئەوانە بۆ خۆیان لە ڕێ لایانداو لەسنور تێپەڕین.

(٢٠) دۆزەخیانو بەهەشتیان وەکو یەك نین، بەهەشتیان هەر خۆیانن بەختەوەرو ڕزگار بو لە سزای خودا.

(٢١) ئەگەر ئێمە ئەم قورئانەمان بناردایە بۆ سەر چیایەك بەخوا تۆ دەتبینی کە ئەو چیا ڕەقە ملکەچو شەقو پەق دەبو لە ترسی خودا (بەداخەوە دڵی خوانەناسان لەو چیا ڕەقانە ڕەقترەو بیر لەو قورئانە ناکەنەوە) ئەوانە چەند وێنەیەکن کە دەیهێنینەوە بۆ خەڵك، بەڵکو ئەوانیش بیربکەنەوەو ڕوو بکەنە خواو پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ و بەرنامەکەی بکەن،

(٢٢) ئەو (ٱللَّهُ)یەی کە هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر جگە لەو نیە کە زانەری هەمو پەنامەکیەكو ئاشکرایەکە وەکو یەك کە ئەو زۆر بەسۆزەو بێنیهایەت میهرەبانە.

(٢٣) ئەو ٱللَّهُ یەی کە جگە لەو هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیەو﴿ ٱلْمَلِكُ ﴾خاوەنی هەمو شتێکەو هەر خۆی دەتوانێت بەبێ ڕێگریو بەرپەرچدانەوە ئاڵوگۆڕی تێدا بکات﴿ٱلْقُدُّوسُ ﴾ پاكو بە فەرو فریشتە بەرێزەکان بە پیرۆزی ڕادەگرن، ﴿ٱلسَّلَٰمُ ﴾ هیچ نەنگیو کەمایەتی تێدا نیەو سەرچاوەی هێمنایەتیە،﴿ٱلْمُؤْمِنُ ﴾هێمنی دەرە بە خاوەن باوەڕان، دڵنیان کە ستەم لە دروستکراوەکانی ناکات،﴿ ٱلْمُهَيْمِنُ ﴾ئاگای لە هەمو شت هەیەو چاودێرە بەسەریانەوە، ﴿ٱلْعَزِيزُ﴾ دەسەڵاتدارەو زاڵە بەسەر هەمو شتدا، ﴿ٱلْجَبَّارُ ﴾ پێکەوەنەری هەمو ئەندامەکانە لە سەرەتاوەو پاش بە خاك بونیشی و بەئێسکەپتورکاوو زۆردارە بەسەر هەمو شتێکدا، ﴿ٱلْمُتَكَبِّرُ ﴾ خۆی لەخۆیدا گەورەیەو کەس شیاوی ئەو وەسفەی نیە جگە لەو. لە فەرمودەدا هاتوە کە {العَظَمَةُ إِزَارِي وَالكِبرِيَاءُ رِدَائِي، فَمَن نَازَعَنِي وَاحِداً مِنهُمَا عَذَّبتُهُ/ متفق عليه/ گەورەیی کراسی منەو لەخۆدا خۆ بەگەورە کردن عەبای منە، جا هەر کەسێك یەکێك لەم وەسفەم بۆ خۆی ببات سزای دەدەم} دورەو پاکە خودا لەو شتەی کە دەیکەن بە هاوبەشی،

(٢٤) ٱللَّهُ خۆی هەرئەو زاتەیە کە ﴿ٱلْخَٰلِقُ﴾ دروستکەری هەمو بوونەوەرەو ﴿ٱلْبَارِئُ﴾ داهێنەری ئەم بوونەوەرەیە لە سەرەتاوە بەو شێوەی کە ویستویەتی، ﴿ٱلْمُصَوِّرُ﴾ وێنەگرە بەو شێوەی کە ئارەزۆی لێیەتی بەو هەمو شێوەو جۆرە ڕەنگاو ڕەنگەوە، ناوە جوانەکان هەر هی ئەون. هەمو ناوێکی چەندین مانای هەیەو هەمو مانایەکیش لە زاتی ٱللَّهُ دا دێتەدی، بەڵام لە هیچ شتێکی تردا ئەوە نایەتەدی بۆ نمونە خودا کەریمە واتە سەخاوەتمەندە دەی ئایا کەس هەیە لەو سەخاوەتمەندتر بێت، یان خودا زانایە ئایا کەس هەیە بەو ئەندازەی ئەو زانابێت، هەروەها بۆ تەواوی ناوەکانی خودا کە هەر خۆی دەزانێت ژمارەیان چەندە. ئەوەی کە لەناو ئاسمانانو زەویدایە هەموی پاكیو بێ عەیبی ئەونیشان دەداتوتەسبیحاتی ئەو دەکات، خۆهەر خۆیشێتی دەسەڵاتدار بەسەر هەمو شتێکدا هیچ شتێك بەسەر ئەودا دەسەڵاتی نیەو کارەکانی هەموی ڕێكوپێكو بەجێیە.

بەم شێوەیە کۆتایی سورەتەکەی بەست بەسەرەتاکەیەوە، واتە گوزەشتەو ئیستاو ئایندە ئەوەی کە لە ئاسمانانو زەویدایە تەسبیحاتی خوا دەکات.

## (٦٠) سورەتی مومتەحەنە (١٣)

سورەتی مومتەحەنە کە سورەتی شەست هەمی قورئانە، لە پاش صولحی حودەیبیەوە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، سیانزە ئایەتە، ئایەتی دوانزەهەمینی لەرۆژی فەتحی مەکەدا دابەزیوە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی نەوەدو دووهەمە، پاش سورەتی (المائدة) و پێش (النساء) دابەزیوە.

لە سورەتی پێشودا کە سورەتی حەشرە لە بارەی خۆشەویستیو یارمەتیدانی یەکتری باوەڕداران لە نێوان خۆیانداو هەروەها یارمەتی دانی بێباوەڕان بۆ یەکتر لە نێوخۆیاندا باسکرا، لەم سورەتەشدا باوەڕداران ئاگادار دەکرێنەوە کە یارمەتی بێباوەڕان نەدەن دژ بە باوەڕداران هەروەك لە سورەتی پێشودا باسکرا، چونکە ئەوە ئیشی مونافقانە.

هۆی دابەزینی چەند ئایەتی سەرەتای ئەم سورەتە، نامەیەك بو کە حاتەبی کوڕی ئەبی بەلتەعە، کاتی چونی پێغەمبەر ﷺبۆ سەر مەکەو داوای لە خوا کردبو، کە هەواڵەکانیان نەگات بە قورەیش هەتا دەچنە لای مەکە، جا ئەم پیاوە نامەیەکی بەدزیەوە نوسی بۆ قورەیش بۆئاگادار کردنەوەیان لەو کارەی پێغەمبەر ﷺودابوی بە ژنێك لەگەل کاروانێکدا بو، کە بیبات بۆ مەکەو ئەم هەواڵەیان بداتێ بەڵام زۆری نەبرد خودا پێغەمبەری ﷺ بەو نامەیە ئاگادارکردەوەو پێغەمبەریش ﷺ عەلیو زوبەیرو میقدادی نارد بەشوێن ئەو ژنەداو فەرموی بچن تا (ڕەوزەتی

**خاخ)** لەوێدا ئافرەتێك لەو كاروانەدایە نامەیەكی پێیە لێی وەربگرن، عەلی دەڵێت: ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ڕەوزەتی خاخ، لەوێ ئافرەتەكەمان بینیو وتمان: ئەو نامەیەی پێتە بۆمان بهێنە، وتی: نامەم پێنیە، وتمان: ڕوتت دەكەینەوە یان دەبێت ئەو نامەیەمان پێبدەیت، دەڵێت: لەناو پرچیدا نامەكەی دەرهێناو نامەكەمان هێنایەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ كەچی لەو نامەیەدا لە حاتەبی كوڕی ئەبو بەلتەعەوە بو بۆ قورەیش هەندێك لە كاروباری پێغەمبەری ﷺ تێدابو، جا پێغەمبەر ﷺفەرمووی: حاتەب ئەمە چیە؟

وتی: پەلەم لێ مەكە، بێگومان من یەكێك لەوانەم كە لكێنراوم بە قورەیشەوەو لە خۆیان نیمو ئەوانەی لەگەڵ تۆدان لە كۆچەریەكان خزمیان لەوێدا هەیەو خاوخێزانیان دەپارێزن لە مەكەدا، جا پێم خۆشبو كە ئەوەم نیە بەم نامەیە كارێك بكەم كە خاو خێزانم بپارێزن، ئەمەم لەبەر بێباوەڕی یان پاشگەز بونەوەم نەبوەو ڕازی نیم بە خوا نەناسی پاش ناسینی ئیسلام، پێغەمبەر ﷺفەرمووی: ڕاستی پێوتن، جا عومەر وتی: وازم لێ بهێنە با لە ملی ئەم دووڕوە بدەم، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەو ئامادەی جەنگی بەدر بوە، تۆ چی دەزانی خوا بە ئەهلی بەدری فەرمووە: من لێتان خۆشبوم، چۆن ئارەزۆ دەكەن ئیش بكەن، جا لەم بارەوە ئەم چەند ئایەتەی سەرەتای ئەم سورەتە دابەزی كە دەفەرموێ:

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی ئەوانەی كە باوەڕتان هێناوە، دوژمنی منو دوژمنی خۆتان مەكەن بە دۆستی گیانی بەگیانی خۆتان ئێوە دۆستایەتی خۆتان بەوان ڕادەگەیەنن لەحاڵێكدا كە ئەوان باوەڕیان نیە بەو پەیامە ڕاستەی كە هاتوە بۆ ئێوە، بەڵكو پێغەمبەرﷺ و ئێوەیان لە خاكی خۆتاندا دەردەكەن، لەبەرئەوەی كە ئێوە باوەڕتان هێناوە بە پەروەردگارتان و تەنها ئەو دەپەرستن؟ ئەگەر ئێوە بۆ غەزا لەڕێگای من و ڕەزامەندی من دەرچون (دۆستایەتیان نەكەن) بە دزیەوە پێیان بڵێن خۆشمان دەوێن لە حاڵێكدا كە من زانام بەوەی كە دەیشارنەوە (هەروەكو چۆن دەیزانم) ئەوەی كە بە ئاشكرا دەیكەن، خۆ هەر كەس لە ئێوە ئەو شتە بكات بە بێگومان لە ڕاستە ڕێگا ترازاوەو سەری لە خۆی تێكداوە.

(٢) ئەگەر ئێوەیان دەست بكەوێت دوژمنایەتیتان دەكەنو دەستو زمانی پیسیان بۆئێوە درێژ دەكەنو ئاواتە خوازن كە ئێوە لە دین دەربچن.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ تُلۡقُونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَقَدۡ كَفَرُواْ بِمَا جَآءَكُم مِّنَ ٱلۡحَقِّ يُخۡرِجُونَ ٱلرَّسُولَ وَإِيَّاكُمۡ أَن تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ رَبِّكُمۡ إِن كُنتُمۡ خَرَجۡتُمۡ جِهَٰدٗا فِي سَبِيلِي وَٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِيۚ تُسِرُّونَ إِلَيۡهِم بِٱلۡمَوَدَّةِ وَأَنَا۠ أَعۡلَمُ بِمَآ أَخۡفَيۡتُمۡ وَمَآ أَعۡلَنتُمۡۚ وَمَن يَفۡعَلۡهُ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ (١) إِن يَثۡقَفُوكُمۡ يَكُونُواْ لَكُمۡ أَعۡدَآءٗ وَيَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ وَأَلۡسِنَتَهُم بِٱلسُّوٓءِ وَوَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ (٢) لَن تَنفَعَكُمۡ أَرۡحَامُكُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُكُمۡۚ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ يَفۡصِلُ بَيۡنَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ (٣) قَدۡ كَانَتۡ لَكُمۡ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ فِيٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذۡ قَالُواْ لِقَوۡمِهِمۡ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمۡ وَمِمَّا تَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرۡنَا بِكُمۡ وَبَدَا بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةُ وَٱلۡبَغۡضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحۡدَهُۥٓ إِلَّا قَوۡلَ إِبۡرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسۡتَغۡفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمۡلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٖۖ رَّبَّنَا عَلَيۡكَ تَوَكَّلۡنَا وَإِلَيۡكَ أَنَبۡنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ (٤) رَبَّنَا لَا تَجۡعَلۡنَا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ وَٱغۡفِرۡ لَنَا رَبَّنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ (٥)

(٣) هەرگیز نەخزمایەتیتانو نە منداڵە كانتان هیچ سوودێكتان پێ ناگەیەنن لە ڕۆژی قیامەتتدا، بەڵكو خوا لە یەكتان جیا دەكاتەوە، جا بۆ ئێوە بەهۆی ئەوانەوە واخەریكە لە دین دەربچن، خودا بینەری ئەو كردارانەیە كە ئێوە دەیكەن. جا كرداری چاك بكەنو بزانن كە هەر ئەوە سودتان پێدەگەیەنێت نەك خزمایەتی هەتا ئەگەر خزمایەتی لەگەڵ پێغەمبەریشدا ﷺ بێت، واتە ئەگەر ئیمانو كرداری چاك نەبێ لەو خزمایەتیە كەڵك وەرناگرێت، هەروەك لە فەرمودەی صەحیحدا هاتوە كە پیاوێك پرسیاری كرد لە پێغەمبەر ﷺ لەبارەی باوكییەوە كە بە كافری مردوە كە ئیستا لە كوێدایە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: {فِي النَّارِ / لەناو ئاگردایە} كاتێك پشتی هەڵكردو ڕۆیشت پێغەمبەرﷺ بانگی كردو فەرمووی: { إِنَّ أَبِي وَأَبَاكَ فِي النَّارِ/ مسلم وغیره/ بێگومان باوكی منو باوكی تۆش لە ئاگردان} ئینجا دەفەرموێ: لەم بارەوە سەیری ئیبراهیم بكەن كە خزمایەتی وای لێنەكرد كە ڕاستی نەڵێتو بێزاری خۆی لەوان دەرنەبڕێت.

لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِيهِمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ ۚ وَمَن يَتَوَلَّ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْغَنِىُّ ٱلْحَمِيدُ ﴿٦﴾ ۞ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ عَادَيْتُم مِّنْهُم مَّوَدَّةً ۚ وَٱللَّهُ قَدِيرٌ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾ إِنَّمَا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَـٰتَلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَأَخْرَجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ وَظَـٰهَرُوا۟ عَلَىٰٓ إِخْرَاجِكُمْ أَن تَوَلَّوْهُمْ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمْ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٩﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا جَآءَكُمُ ٱلْمُؤْمِنَـٰتُ مُهَـٰجِرَٰتٍ فَٱمْتَحِنُوهُنَّ ۖ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَـٰنِهِنَّ ۖ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَـٰتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى ٱلْكُفَّارِ ۖ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ ۖ وَءَاتُوهُم مَّآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۚ وَلَا تُمْسِكُوا۟ بِعِصَمِ ٱلْكَوَافِرِ وَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْـَٔلُوا۟ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ ذَٰلِكُمْ حُكْمُ ٱللَّهِ ۖ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ ۚ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠﴾ وَإِن فَاتَكُمْ شَىْءٌ مِّنْ أَزْوَٰجِكُمْ إِلَى ٱلْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَـَٔاتُوا۟ ٱلَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَٰجُهُم مِّثْلَ مَآ أَنفَقُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

﴿٤﴾ حەقیقەت ئەوەیە كە بۆ ئێوە پێشەواییەكی جوان هەیە بۆ فێربونی خواناسی ڕاستەقینە لە ئیبراهیم‌و ئەو كەسانەی كە لەگەڵ ئەودا بون،ئەو كاتەی كە بە گەلەكەی خۆیان وت: بێگومان ئێمە بێوەرین لە ئێوەی خوا نەناس‌و لەوانەی كە دەیانپەرستن جگە لە ﷲ باوەڕمان پێتان نەماوەو دوژمنایەتی‌و ڕق‌و قین لەنێوان ئێمەو ئێوەدا ئاشكرابوە بۆ هەمیشە تا ئەو كاتەی كە باوەڕ دەهێنن بە خوا بە تەنهایی، دەبێت ئێوە لەوانەدا پەیڕەوی ئیبراهیم‌و پەیڕەوانی بكەن، جگە لە یەك قسەی ئیبراهیم كە وتی: بە باوكی بەدڵنیاییەوە من داوای لێخۆشبونت بۆ دەكەم، نابێت باوەڕداران داوای لێخۆشبون بكەن بۆ خوانەناسان مادام سوربن لەسەر شیركی خۆیان، ئیبراهیم وتی: من خاوەنی هیچ شتێك نیم بۆ تۆ لەلای خودا، ئەی پەروەردگارمان هەر بەتۆ پشتمان بەستوەو هەر بۆ لای تۆیە گەڕانەوەمان‌و سەرئەنجامیش هەر بۆ لای تۆیە،

ئەبو هورەیرە دەڵێت: {زَارَ النَّبِيُّ ﷺ قَبْرَ أُمِّهِ فَبَكَى وَأَبْكَى مَنْ حَوْلَهُ فَقَالَ اسْتَأْذَنْتُ رَبِّي فِي أَنْ أَسْتَغْفِرَ لَهَا فَلَمْ يُؤْذَنْ لِي وَاسْتَأْذَنْتُهُ فِي أَنْ أَزُورَ قَبْرَهَا فَأُذِنَ لِي فَزُورُوا الْقُبُورَ فَإِنَّهَا تُذَكِّرُ الْمَوْتَ/ مسلم وغيره/ پێغەمبەر ﷺ سەردانی گۆڕی دایكی كرد، جا گریاو ئەوانەی دەوریشی گریان، ئینجا فەرموی: داوام كرد لەپەروەردگارم كەداوای لێخۆشبونی بۆ بكەم ماوەی پێنەدام‌و داوام لێكرد كەسەردانی گۆڕەكەی بكەم ماوەم پێدرا، سا سەردانی گۆڕەكان بكەن ئەوسا بێگومان كە مردنتان دەخاتەوە بیر}.

جا ئیبراهیم درێژە بەدوعاكانی دەداو دەڵێ:

﴿٥﴾ ئەی پەروەردگارمان نەمانكەیت بە تاقیكەرەوە بۆ خوانەناسان كە زاڵبن بەسەرمانداو زیاتر خۆیان بەڕاست‌و ئێمە بە ناڕاست بزانن، یان بۆ لەبەین بردنی ئەوان عەزاب بنێریت‌و ئێمەیش دوچاری سزای دنیا ببین، بە هۆی كرداری ئەوانەوەو چاوپۆشیمان لێبكە ئەی پەروەردگارمان، بێگومان كە تۆ هەر خۆتیت دەسەڵاتدارو كاربەجێ، كەواتە لادان لە بەرنامە و بڕیارو سنورەكانی ﷲ نابەجێ و نەفامانەیە‌و لەریزی ئاژەڵیش دێتە خوارترەوە.

﴿٦﴾ بە حەقیقەت ئەی ئوممەتی محمد ﷺ لەو پێغەمبەرەوە پەیڕەوانیدا پێشەواییەكی جوان هەیە بۆ ئەوانەی كە هیوایان بە خواو باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی هەیەو هەر كەسێكیش پشت بكاتە ئەو ئایینە هەر خۆی زیان دەكات‌و خوا هیچ پەكێكی لەبەر ئەو ناكەوێت، ئەوسا خودا هەر خۆی بێنیازو سوپاسكراوە، جا چی ئێوە سوپاسی بكەن یان نە یكەن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنِّي أَرَى مَا لَا تَرَوْنَ وَأَسْمَعُ مَا لَا تَسْمَعُونَ أَطَّتْ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلَّا وَمَلَكٌ وَاضِعٌ جَبْهَتَهُ سَاجِدًا لِلَّهِ وَاللهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا / الترمذي.الالباني:حسنه/ بێگومان من دەیبینم ئەوەی كەئێوە نایبینن، وە دەیبیستم ئەوەی كە ئێوە نایبیسن ئاسمان چركە چركی دێت‌وپێویستكراوە لەسەری كەوا چركە چركی بێت چونكە جێگای چوار پەنجەی نیە مەگەر فریشتەیەك ناوچاوی خۆی تێدا دانابێت بەسوجدە بردن بۆخوا، سوێند بەخوا ئەگەر بزانن ئەوەی كەمن دەیزانم كەم پێدەكەنین‌و زۆر دەگریان}

جا تۆ ئەی نەوەی ئادەم ئەگەر یادی خوا نەكەیت دەبێ چ زیانێك لەخوا بكەوێت؟ ئەی مرۆڤ تۆ بەرێزی بەنافەرمانی خوا، خۆت بێ ڕێز مەكە دڵنیابە ئەگەر دۆستی خوانە بیت بونەوەر هەمو دوژمنتە.

﴿٧﴾ نزیكە خودا لەنێوان ئێوەو ئەو كەسانەی كە دوژمنایەتی یەكترتان كردوەدۆستایەتی دروست بكات، بەهۆی باوەڕ هێنانیان‌و پەیوەندیكردنیان پێتانەوە، جا بەڕاستی خودا بەهێز و توانایە و

هەمو شت لەلای ئەو ئاسانەو خودا زۆر چاوپۆشیکەرە لە تاوانی بەندەکانیو بێسنور میهرەبانە بۆیان، جا دوور نیە ئەوەی کە ئەمڕۆ داواتان لێدەکرێت خۆشتان نەوێنو بێزاری خۆتان بەرامبەریان دەر بخەن، پەروەردگار هیدایەتیان بداتو دۆستایەتی لەناو دڵەکانتاندا دروست بکات. ئەسمای کچی ئەبوبەکر دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ دایکم کە موشریك بو، هات بۆلام جا پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ کە ئایا منیش صیلەی ڕەحم بەجێبهێنم لە گەڵ ئەودا، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {نَعم/ متفق عليه/ بەڵێ} جا دەڵێن ئەو کاتە ئەم ئایەتە دابەزی کە دەفەرموێ:

(٨) خودا ڕێگەی لە ئێوە نەگرتوە کە لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شەڕیان لەگەڵدا نەکردون لەسەر ئایینو لەسەر زەویو زاری خۆتاندا دەریان نەکردون کە چاکەیان لەگەڵدا بکەنو دادپەروەرانە لەگەڵیاندا ڕەفتار بکەن، چونکە بەڕاستی خودا دادپەروەرانی خۆشدەوێت.

پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ الْمُقْسِطِينَ عِنْدَ الله عَلَى مَنَابِرَ مِنْ نُورٍ عَنْ يَمِينِ الرَّحْمَنِ عَزَّ وَجَلَّ وَكِلْتَا يَدَيْهِ يَمِينٌ الَّذِينَ يَعْدِلُونَ فِي حُكْمِهِمْ وَأَهْلِيهِمْ وَمَا وَلُوا/ مسلم وغيره/ بێگومان دادپەروەران لەلای خوا لەسەر مینبەرەکانی نورن لەلای ڕاستی خوای بەتواناو گەورەو هەردوولای هەر ڕاستە، ئەو کەسانەی کە دادپەروەرن لەبڕیاریانداو لەناو کەسو کاریاندا و لەنێوان ئەوانەی کەسەرپەرشتیان دەکەن} .

(٩) خوا تەنها بەرگریتان لێدەکات لە دۆستایەتی کردنتان لەگەڵ ئەو کەسانەی کە لەسەر ئایین شەڕیان پێفرۆشتونو لەسەر زەویو زاری خۆتاندا دەریان کردونو یارمەتیان داوە لەسەر دەرکردنتان، جا هەر کەسێك ئەوانە بکات بە دۆستی خۆی، ئەوسا ئەوانە ستەمکارنو زیانیان بە خۆیان گەیاندوە.

بەڵێ بەندێك لە ڕێکەوتنەکانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ بێباوەڕانی مەکەدا لەئاشتەوایی حودەیبیەدا، ئەوەبو کە ئەگەر کەسێك لەوان هات بۆناو موسڵمانان ئەگەرچی موسڵمانیش بێت دەبێت بیگەڕێننەوە، جا پەروەردگار ئەم بڕیارە گشتیە کە لەوسونەتدا هاتبو تایبەت کردووەو حوکمی ئافرەتانی جیا کردەوە و فەرموێ:

(١٠) ئەی ئەو کەسانەی کە خواناسن هەر کاتێك ئافرەتانی باوەڕداری کۆچکەر هاتنە لاتان (لەکاتی ئاشتەوایی حودەیبیەدا)و وتیان: باوەڕمان هێناوە تاقیان بکەنەوەو بزانن ڕاست دەکەن سوێندیان بدەنو بڵێن: تەنها لەبەر موسڵمان بون هاتوینو هیچ ڕقو کینەیەکمان لە مێردی خۆمان نەبوە، خوا ئاگادارە بە ئیمانیان جا ئەگەر زانیتان باوەڕدارن نەکەن بیانگەڕێننەوە بۆلای خوانەناسان نە ئەو ئافرەتانە حەڵاڵن بۆ ئەو خوانەناسانە، نە ئەو خوانەناسانەش حەڵاڵن بۆ ئەو ئافرەتانەو ئەوەی کە مێردە خوانەناسەکەی خەرجی کردوە تێیدا بیدەنەوە، ئەگەر مارەییتان پێدان نیکاحیان بکەن هیچی تێدا نیە و نیکاحی ئافرەتانی خوانەناس نامێنێت، ئەگەر لە عیدەی تێپەڕیو موسڵمان نەبو، ئێوەش داوای ئەوە بکەن کە خەرجتان کردوە لەو ئافرەتانەداو ئەوانیش با داوای ئەوە بکەن کە خەرجیان کردوە، ئەوە بڕیاری خوایە کە بڕیار دەدات لە نێوانتانداو دەبێت هەردوولا جێ بەجێی بکەنو خوا زانایە بە ئیشەکانتانو دانایە لە دانانی بەرنامەو ڕێبازەکەیداو لادان لێی گومڕاییو سەرلێشێوانە لە دنیاداو سزای بەژانی ڕۆژی دواییشە. جاوردبینەوەو تەماشای یاسای  خودابکەن چۆن داکۆکی لەسەر مافی مرۆڤ دەکات بەبێ جیاوازی.

(١١) خۆ ئەگەر هەندێك لە ژنانتان پاشگەزبوونەوەو چوونە ناو خوانەناسانەوە (ئەوەی تیایاندا خەرجکراوە نەیانگەڕاندەوە بۆمێردە باوەڕدارەکانیان) جا هەرکاتێك دەستکەوتتان لەو خوانەناسانەوە دەستکەوت پێش دابەشکردنی ئەوەندەی کە خەرجیان کردوە لەو ژنانەیان پێیان بدەنەوەو لەو خوایە بترسن کە باوەڕتان پێ هێناوەو مافی کەس نەخۆن.

(١٢) ئەی پێغەمبەر ﷺ هەر کاتێك ئافرەتانی باوەڕدار هاتنە لاتو پەیمانیاندا کە هیچ شتێك نەکەن بە هاوبەشی خوداو دزی نەکەنو داوێن پیسی نەکەنو منداڵانی خۆیان نەکوژنو بەدرۆ منداڵی کەسی تر نەکەن بە منداڵی مێردیانو لە چاکەدا فەرمانی تۆ نەشکێنن، تۆش لەوان ئەو پەیمانە وەربگرەو داوا لە خوا بکە کە لێیان خۆش ببێت، بێگومان کە خودا زۆر چاوپۆشیکەرو بێنیهایەت میهرەبانە. بوخاری لە دایکی عەتیەوە هێناویەتی کە پەیمانمان دا بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر ئەوەی کە: (هاوبەش بۆ خودا دانەنێین و...و...هتد)و بەرگری کردین لە گریانی دەنگی بەرز لە تازیەدا، جا ئافرەتێك دەستی خۆی گرتەوەو وتی: فڵانە ژن بۆ کەسوکاری من گریاوەو دەمەوێت منیش پاداشتی بدەمەوەو بە دەنگی بەرز بۆی بگریم لە تازیەدا، جا پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی پێ نەوت، ڕۆیشتو دوایی گەڕایەوەو پەیمانی پێدا، (مسلم)یش ئەم ڕیوایەتەی هێناوەتەوە ئەمەی لێ زیاد کردووە کە (جگە لە دایکی عەتیەو دایکی سولەیم کچی میلحان کەسێکی تر لەمبارەوە وەفای بەم پەیمانە نەکرد)، لە ڕیوایەتێکی تری بوخاریدا دەڵێت: پێنج ئافرەت وەفایان پێکردوە ئەو دووانەو سێ ئافرەتی تریش.لێرەوە دەردەکەوێت کەگریانی ئافرەتان بۆ مردو دابونەریتی سەردەمی نەفامییە و ئیسلام حەرامی کردوە. بوخاری لەخاتون عائیشەی خێزانی

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ عَلَىٰٓ أَن لَّا يُشۡرِكۡنَ بِٱللَّهِ شَيۡـٔٗا وَلَا يَسۡرِقۡنَ وَلَا يَزۡنِينَ وَلَا يَقۡتُلۡنَ أَوۡلَٰدَهُنَّ وَلَا يَأۡتِينَ بِبُهۡتَٰنٖ يَفۡتَرِينَهُۥ بَيۡنَ أَيۡدِيهِنَّ وَأَرۡجُلِهِنَّ وَلَا يَعۡصِينَكَ فِي مَعۡرُوفٖ فَبَايِعۡهُنَّ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُنَّ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٢﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَوَلَّوۡاْ قَوۡمًا غَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ قَدۡ يَئِسُواْ مِنَ ٱلۡأٓخِرَةِ كَمَا يَئِسَ ٱلۡكُفَّارُ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلۡقُبُورِ ﴿١٣﴾

## ٦١ سُورَةُ الصَّفِّ ١٤

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۖ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٢﴾ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ﴿٤﴾ وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوۡمِهِۦ يَٰقَوۡمِ لِمَ تُؤۡذُونَنِي وَقَد تَّعۡلَمُونَ أَنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡۖ فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿٥﴾

پێغەمبەرەوە ﷺ هێناویەتی کە: {أَنَّ رَسُولَ الله كَانَ يَمْتَحِنُ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِ مِنْ الْمُؤْمِنَاتِ بِهَذِهِ الْآيَةِ بِقَوْلِ الله ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ..الي قوله إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ قَالَ عُرْوَةُ قَالَتْ عَائِشَةُ فَمَنْ أَقَرَّ بِهَذَا الشَّرْطِ مِنْ الْمُؤْمِنَاتِ قَالَ لَهَا رَسُولُ الله ﷺ قَدْ بَايَعْتُكِ كَلَامًا وَلَا وَ الله مَا مَسَّتْ يَدُهُ يَدَ امْرَأَةٍ قَطُّ فِي الْمُبَايَعَةِ مَا يُبَايِعُهُنَّ إِلَّا بِقَوْلِهِ قَدْ بَايَعْتُكِ عَلَى ذَلِكِ/ بەراستی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوئافرەتانەی کە کۆچیان دەکرد بۆ لای بەم ئایەتە تاقی دەکردنەوە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ يُبَايِعۡنَكَ..الي قوله إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾ عوروە وتی: خاتون عائیشە وتویەتی: کە هەر ئافرەتێکی باوەڕدار دانی بەوەدا نابێت پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموە: بەراستی پەیمانم لەگەڵتابەست، بەقسە، خۆ بەخوا هەرگیز لەو پەیمانانەدا دەستی نەکەوتوە لەدەستی هیچ ئافرەتێك هەر بەقسە بەیعەتی لەگەڵدا دەکردن (کەدەیفەرمو) بەراستی پەیمانم لەگەڵتا بەست لەسەر ئەوە}.

﴿١٣﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە ئەو گەلەی کە خوا غەزەبی لێ گرتون، واتە: جولەکە مەکەن بە دۆستی خۆتان، بە راستی ئەوانە نائومێدن بە هاتنی ڕۆژی دوایی، هەروەکو چۆن خوانەناسان لە مردوی گۆڕستانەکان نائومێدن و پێیان وایە زیندو بونەوەیەکیان بۆنیە و هیچ ئومێدی چاکیان لێناکرێ.

## ٦١ سورەتی سەف ١٤

سورەتی سەف کە سورەتی شەستو یەکەمی قورئانە، زۆرینەی ڕاڤەکاران لەسەر ئەوەن کە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، چواردە ئایەتە، ناسخو مەنسوخی تێدا نیە، وتراوە بە گوێرەی دابەزین سورەتی سیویەکەمەو پاش سورەتی (القارعة) و پێش (الهمزة) دابەزیوە. عەبدوڵای کوڕی سەلام دەڵێت: {قَعَدْنَا نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ الله ﷺ فَتَذَاكَرْنَا فَقُلْنَا لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الْأَعْمَالِ أَحَبَّ إِلَى الله لَعَمِلْنَاهُ فَأَنْزَلَ الله تَعَالَى: ﴿سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ ...﴾ / الترمذي، صححه الألباني/ هەندی لە یارانی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ یەکدا دانیشتبوین، جا لەنێوان خۆماندا باسمان دەکرد جا وتمان ئەگەر بمانزانایە کە کام کردار لە لای اللّٰه خۆشەویسترە بەخوا ئەوەمان ئەنجامان دەدا، ئەوسا اللّٰه ئەم ئایەتانەی سەرەتای سورەتی صەفی ڕەوانەکرد کە بۆی ڕون کردنەوە کە پەروەردگار ئەو موجاهیدانەی خۆش دەوێت کە لەرێی ئەودا پاڵ بەپاڵی یەك دژ بە بێباوەڕان دەجەنگن.}

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ ئەوەی لەناو ئاسمانانو لەناو زەویدایە هەموی تەسبیحاتی خوا دەکەنو لەیادی خوا بێ ئاگانینو هەر خۆیەتی دەسەڵاتداری کاربەجی، ئەگەر هەندێکیان لەو بەشە سەربەخویە کە پێیان دراوە بە زمانیش تەسبیحاتی پەروەردگار نەکەن، بەڵام هەمو ئەندامەکانی لەشیان گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگارنو توانایو زانایوئاگایو بێعەیبی اللّٰه پیشان دەدەنو تە سبیحاتی ئەوزاتە دەکەنو هەربەشێکی تەماشا بکرێت بەڵگەیەکی گەورەو گرنگە لەسەر پاکیو بێ عەیبیو زانایيو ئاگایو کاربەجێی ئەوزاتە.

﴿٢﴾ ئەی باوەڕداران بۆ دەڵێنو کردەوەتان نیە.

﴿٣﴾ ڕقی خوا زۆر گەورەیە لەو قسانەی کە دەیکەنو کرداری پێناکەن. لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە کە: {آية المُنَافِق ثَلَاث: إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أخلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ/ نیشانەی دووڕوو سیانە **یەکەم**: هەر کاتێك قسەی کرد درۆ دەکات، **دووهەم**: هەر کاتێك بەڵێنی دا نایباتە سەر، **سێهەم**: هەر کاتێك ئەمانەتی پێ سپێردرا خیانەتی تێدا دەکات} پێویستە خاوەن باوەڕ ئاگای لە قسەکانی بێتو خۆی بە بەرپرس بزانێت سەبارەت بە قسەو کردارەکانی، نەك فەرمان بکات بەخەڵکی بە کرداری باشو خۆی نەیکات، ئەوەبو لەسورەتی بەقەرە ئایەتی/ چلوچوار/فەرموی: ﴿ئێوە فەرمان بەخەڵکی دەدەن بەچاکەو خۆتانتان لەبیر چوەتەوە کە خۆیشتان قورئان دەخوێننەوە، دەی ئەوە بۆتێناگەن؟! ﴾.

(٤) بێگومان کە ﷲ ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە یەك ڕیز لە دژایەتی خوانەناسان شەڕ دەکەن، وەك ئەوە وابن کە چەندین ساختمانی بەیەکەوە جۆشدراون، ئەبوزەڕ دەڵێت: پرسیارم کرد لە پێغەمبەر ﷺ کام کردوە لە هەمو چاکترە؟ فەرموی: {إِيمَانٌ بالله وَجِهَادٌ فِي سَبِيلِهِ/ متفق عليه/ باوەڕ بە ﷲ و جیهاد لەرێی ئەودا}
وە ئەبو هورەیرە دەڵێت: {قِيلَ لِلنَّبِيِّ ﷺ مَا يَعْدِلُ الْجِهَادَ فِي سَبِيلِ الله عَزَّ وَجَلَّ قَالَ لَا تَسْتَطِيعُونَهُ قَالَ فَأَعَادُوا عَلَيْهِ مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلَاثًا كُلُّ ذَلِكَ يَقُولُ لَا تَسْتَطِيعُونَهُ وَقَالَ فِي الثَّالِثَةِ مَثَلُ الْمُجَاهِدِ فِي سَبِيلِ الله كَمَثَلِ الصَّائِمِ الْقَائِمِ الْقَانِتِ بِآيَاتِ الله لَا يَفْتُرُ مِنْ صِيَامٍ وَلَا صَلَاةٍ حَتَّى يَرْجِعَ الْمُجَاهِدُ فِي سَبِيلِ الله تَعَالَى/متفق عليه/ پرسیارکرا لە پێغەمبەری خوا ﷺ چ شتێك هاوتای جیهادە لە رێی ﷲ دا فەرموی: ئەوەتان پێناکرێت جا دوو جار یان سێ جار ئەم پرسیارەیان لێکرد، جا هەمو جار دەیفەرمو: ئەوەتان پێناکرێت پاشان فەرموی: وێنەی ئەو کەسەی کە جیهاد دەکات لە ڕێی ﷲ دا، وەك ئەوکەسە وایە کە بەرۆژ بە ڕۆژو بێتو شەوان شەو نوێژ بخوێنێتو بەردەوام بێت لەسەر خوێندنی قورئان کە لەرۆژو لەنوێژ نەبچڕێت هەتا ئەو غەزاکەرە دەگەڕێتەوە بۆماڵی خۆی، جا ئەم ئایەتەش وەڵامی ئەوانە بو کە دەیان ویست بزانن کە ﷲ چ کردارێکی لە هەمو خوشتر دەوێت، ﷲ ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە ئەم سێ سیفەتەیان تێدابێت:

**یەکەم**: پیاوی مەیدانی جەنگو جیهاد بن.

**دووهەم**: موخلص بنو نیەتیان لەو جیهادە تەنها بەرزکردنی فەرمانی ﷲ بێت.

**سێهەم**: پاڵ بەپاڵی یەكو دور لە لە بەش بەشیو تەفرقە هەستن بۆ بەجێهێنانی ئەو جیهادە. جا ئەوەیە سیفەتی خواناسانی ڕاستەقینە نەك وەك ئێمە چەند دەستەو چەند بەشینو هەر کەسێکیش خۆی بە جێنشینی ڕاستەقینەی ئەو ئایینە دەزانێت، ئەگەر چی ئایین بە دەیان فرسەخ لێمانەوە دورە، کامەیە قسەی ڕاستو کردارمان، کامەیە یەك ڕیزیمان زۆرێکی زۆر لە ئوممەتی ئیسلام بوەتە داردەستی خوانەناسانو براو خوشکی موسڵمانی خۆیانیان بۆ ڕاو دەکەن؟! وا وەیلا لەو موسیبەتە. نازانن کوشتنو ئازاردانی موسڵمان چەند تاوانێکی گەورەیە لەلای خوای خاوەن دەسەڵات.

(٥) بە بیریان بهێنەوە ئەو کاتەی کە موسا بە گەلەکەی خۆی وت: ئەی گەلی خۆم بۆچی ئازارم دەدەن لە حاڵێکدا چاك دەزانن کە من پێغەمبەری خوداموو ڕەوانەکراوم بۆ لای ئێوە، جا کاتێك لە ڕاستی لایانداو ئازاری موسایان دا خوایش دڵی ئەوانی بەو شێوەی کە هەر لە سەرەتاوە بۆیان دانرابو لە حەقو ڕاستی لاداو

وَإِذۡ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُم مُّصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَمُبَشِّرَۢا بِرَسُولٖ يَأۡتِي مِنۢ بَعۡدِي ٱسۡمُهُۥٓ أَحۡمَدُۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ (٦) وَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ وَهُوَ يُدۡعَىٰٓ إِلَى ٱلۡإِسۡلَٰمِۚ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ (٧) يُرِيدُونَ لِيُطۡفِـُٔواْ نُورَ ٱللَّهِ بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَٱللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡكَٰفِرُونَ (٨) هُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ رَسُولَهُۥ بِٱلۡهُدَىٰ وَدِينِ ٱلۡحَقِّ لِيُظۡهِرَهُۥ عَلَى ٱلدِّينِ كُلِّهِۦ وَلَوۡ كَرِهَ ٱلۡمُشۡرِكُونَ (٩) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ هَلۡ أَدُلُّكُمۡ عَلَىٰ تِجَٰرَةٖ تُنجِيكُم مِّنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ (١٠) تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ بِأَمۡوَٰلِكُمۡ وَأَنفُسِكُمۡۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ (١١) يَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ وَيُدۡخِلۡكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ وَمَسَٰكِنَ طَيِّبَةٗ فِي جَنَّٰتِ عَدۡنٖۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ (١٢) وَأُخۡرَىٰ تُحِبُّونَهَاۖ نَصۡرٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَفَتۡحٞ قَرِيبٞۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ (١٣) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ (١٤)

(ئەوەی لە ئەزەلدا شاراوە بو دەرکەوتو کافر بون)و خواش گەلی خوانەناسو لەسنور تێپەڕیو تازە ڕێنمایی ناکات (٦) جا بە بیریان بهێنەوە ئەو کاتەی کە عیسای کوڕی مەریەم وتی: ئەی کوڕانی یەعقوب بێگومان من پێغەمبەری خودام ڕەوانە کراوم بۆ لای ئێوەو باوەڕم بە تەورات هەیەو مژدەدەریشم بە پێغەمبەرێك کە پاش من دێت کە ناوی ئەحمەدە ( کە یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ و لە فەرمودەدا هێناویانە کە فەرمویەتی: {إِنَّ لِي أَسْمَاءً: أنا مُحَمَّدٌ، وَأَنَا أحمد، وَأَنَا الماحي يَمحو الله بِهِ الكُفرَ، وَأَنَا الحَاشِرُ يُحشَرُ النَّاسُ عَلَى قَدَمي، وَأَنَا العَاقِبُ/ الترمذي، صححه الألباني/ بێگومان من چەندین ناوم هەیە: من محمدم و من ئەحمەدم و من ماحیم کە خوا بێ دینی بە من لادەبات لە نیوەدوورگەی عەرەبدا و من حاشرم خودا لەپاش من حەشری خەڵك دەهێنێت، وە من عاقیبم کە هیچ پێغەمبەرێکی تر پاش من نایەت} پێغەمبەرمان ﷺ چەندین ناوی تری هەیە لێرەدا مەبەستمان هێنانی (أحمد) بو کە عیسا عليه السلام مژدەی هاتنی داوەو هەندێك بەو بۆنەوە لەم ڕاستیە هەڵە بونو ڕێگای چەوتییان گرتووەتەبەرو چاوەڕوانی هاتنی ئەحمەدیان کردووە ئێستاش گەلێك بەوە خەڵەتاونو بە گومانێك چاویان لەو هەمو ڕاستیە نوقاندوە، خوا دەفەرموێ: جا کاتێك کە ئەو پێغەمبەرەیان بە نیشانەی ڕۆشنەوە بۆ هات وتیان: ئەمە جادویەکی ئاشکرایەو لە

سُورَةُ الجُمُعَةِ ٦٢ ١١

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ الْمَلِكِ الْقُدُّوسِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ ﴿٢﴾ وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٣﴾ ذَٰلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٤﴾ مَثَلُ الَّذِينَ حُمِّلُوا التَّوْرَاةَ ثُمَّ لَمْ يَحْمِلُوهَا كَمَثَلِ الْحِمَارِ يَحْمِلُ أَسْفَارًا ۚ بِئْسَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِ اللَّهِ ۚ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿٥﴾ قُلْ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ هَادُوا إِن زَعَمْتُمْ أَنَّكُمْ أَوْلِيَاءُ لِلَّهِ مِن دُونِ النَّاسِ فَتَمَنَّوُا الْمَوْتَ إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ ﴿٦﴾ وَلَا يَتَمَنَّوْنَهُ أَبَدًا بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ ﴿٧﴾ قُلْ إِنَّ الْمَوْتَ الَّذِي تَفِرُّونَ مِنْهُ فَإِنَّهُ مُلَاقِيكُمْ ۖ ثُمَّ تُرَدُّونَ إِلَىٰ عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾

ناسینی پێغەمبەر ﷺ خۆیان بوراد، جا خودا لەدەمیان دەداتو دەفەرموێ:

﴿٧﴾ کێ هەیە ستەمکارتر لەو کەسەی کە درۆ بە دەمی خوداوە بکات لە حاڵێکدا کە ئەو بۆ ئاینی ئیسلام بانگ بکرێت کە مایەی خۆشبەختی هەردوو دنیایە، بەڕاستی ئەوە خوانەناسو ستەمکارەو خواش گەلی خوانەناسو ستەمکار ناگەیەنێت بە خۆشبەختیو ڕێنمایيان ناکات.

﴿٨﴾ ئەوانە (ئەوەندە نەزانن) دەیانەوێت ڕوناکی خوا بە فوی دەمیان بکوژێننەوە، جا خوا ڕوناکی خۆی کە ئاینی ئیسلامە تەواو دەکات ئەگەر چی خوانەناسانیش پێیان ناخۆشبێت، واتە هەرچۆنێك ناتوانرێت ڕوناکی خۆر بە فو بکوژێننەوە، هەر ئاوەهاش ڕوناکی ئاینی ئیسلام ناتوانن بکوژێننەوە.

﴿٩﴾ خوا ئەو زاتەیە کە پێغەمبەرەکەی خۆی ﷺ ناردوە بە ڕێنمایيو ئاینی ڕاستەوە تا ئەو ئاینە سەربخات بەسەر تەواوی ئاینەکانی تردا ئەگەرچی موشریکانیش پێیان ناخۆش بێت، بەدڵنیایيەوە بەڵگەکانی ئەم ئاینە سەرکەوتو دەبێت بەسەر هەمو بۆچونەکانداو بەدەستی پیاوانی ئەهلی جیهادیش ئەو ئاینە لە ئاخر زەماندا زاڵ دەبێت بەسەر هەمو دینەکاندا، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {لَيَنزِلَنَّ ابْنُ مَرْيَمَ حَكَمًا عَادِلًا فَلَيَكْسِرَنَّ الصَّلِيبَ وَلَيَقْتُلَنَّ الْخِنْزِيرَ وَلَيَضَعَنَّ الْجِزْيَةَ وَلَتُتْرَكَنَّ الْقِلَاصُ فَلَا يُسْعَى عَلَيْهَا وَلَتَذْهَبَنَّ الشَّحْنَاءُ وَالتَّبَاغُضُ وَالتَّحَاسُدُ وَلَيَدْعُوَنَّ إِلَى الْمَالِ فَلَا يَقْبَلُهُ أَحَدٌ/ مسلم وغيره/ سوێند بێت کە عیسای کوڕی مەریەم دادەبەزێت کەدەبێت بە فرمانڕەوایەکی دادپەروەر، ئینجا سەلیب دەشکێنێتو بەراز دەکوژێتوسەرانە لادەباتو وشتر بەرەڵا دەکرێتو گوێی پێنادرێت و بەخاڵەت ورق لەیەکبونەوە و حەسادەت لەناو دەچێت و بانگ دەکات بۆ وەرگرتنی ماڵ ئەوسا هیچ کەسێك وەری ناگرێت} .

﴿١٠﴾ ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕدارن دەتانەوێت بازرگانییەکی واتان پیشان بدەم کە لە سزای بەژان ڕزگارتان بکات؟

﴿١١﴾ ئەو بازرگانیە ئەوەیە کە باوەڕ بە خواو بە پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەنو لە ڕێگای بەرزکردنەوەی ئاینەکەی ئەودا هەوڵبدەن بە ماڵتانو بە گیانتان، ئەگەر بەخۆتان بزانن ئەوە شتێکی چاکە بۆتان، جا لە پاداشتی ئەوەدا،

﴿١٢﴾ اللَّهُ لە گوناهتان خۆش دەبێتو دەتانخاتە ناو باخچەیانێکەوە کە چەندین جۆگە بەناویاندا دەڕواتو جێگایانێکی پاکە کە لەناویدا باخچە گەلێکی هەمیشەیی تێدایە بۆ دانیشتن کە ئەوەیە سەرکەوتنو بەخششی گەورە،

﴿١٣﴾ ئەوسا شتێکی تریش کە ئێوە پێتان خۆشە کە ئەویش یارمەتیەکە لەلایەن خواوەو سەرکەوتنێکی نزیکە، جا ئەی محمد ﷺ ئەم مژدەیە بە خاوەن باوەڕان بدە. وە ئەمەش جگە لە پاداشتی دوارۆژ پاداشتێکی دنیایی بو بۆ ئەوانە کە بەماڵو گیانیانەوە یارمەتی دەری ئەم ئاینەن.

﴿١٤﴾ ئەی باوەڕداران ببن بە یارمەتیدەری ئاینی خودا هەروەکو چۆن عیسای کوڕی مەریەم بە یارانی خۆی وت: کێ بەرەو ڕێبازی خوا یارمەتیم دەدات؟ یارانی وتیان: ئێمە یارمەتیدەری ئاینی خوداین، ئەوسا تاقمێك لە مندالانی یەعقوب باوەڕیان هێناو تاقمێکی تریان هەروا بە بێباوەڕی مانەوە، جا ئێمە خاوەن باوەڕەکانیانمان یارمەتی دا تا سەرکەون بەسەر دوژمنانی خۆیاندا، ئەوسا ئەوان سەرکەوتن.

ئەمە هەڵنانی موسڵمانانەو تێیان دەگەیەنێت کە ئەگەر دەتانەوێت سەرکەوتنو ئەو هەمو خێرو چاکەی کەباسکرا پێتان بدرێت دەی ئێوەش بەڕاستی ببن بە یارمەتیدەری ئاینی پیرۆزی ئیسلام دڵنیابن کە ئێوەش یارمەتی دەدەینو بەسەر دوژمنانی خۆتاندا زاڵتان دەکەین.

## ٦٢ سورەتی جومعە ١١

سورەتی جومعە کە سورەتی شەستو دووهەمی قورئانە، کە بە کۆی دەنگ لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، یانزە ئایەتە، ناسخو مەنسوخی تێدا نیە، لە سورەتی پێشودا فەرمان بەجیهاد دراو بە تیجارەتو بازرگانی ناوی لێبرا، لەم سورەتەشدا باسی عیبادەتێکی گەورەدەکرێت، کە لە بازرگانی دنیایی گەورەترە ئەویش نوێژی جومعەیە، هەروەها باسی ریزەکان کرا لە مەیدانی شەڕدا، لێرەش باس لە نوێژی جومعە دەکات کە پێویستی بەکۆمەڵو ریزەکان هەیە. عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێت:{أَنَّ النَّبِيَّ ﷺكَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْفَجْرِ يَوْمَ الْجُمُعَةِ الم تَنْزِيلُ السَّجْدَةِ وَهَلْ أَتَى عَلَى الْإِنْسَانِ حِينٌ مِنْ الدَّهْرِ وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺكَانَ يَقْرَأُ فِي صَلَاةِ الْجُمُعَةِ سُورَةَ الْجُمُعَةِ وَالْمُنَافِقِينَ /مسلم وغيره/ کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی بەیانی رۆژی جومعەدا سورەتی (سەجد)ەو (دەهر)ی خوێندوەو لە نوێژی جومعەدا (جومعە)و (مونافقین)ی خوێندوە} .

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەوەی کە لەناو ئاسمانانو لەناو زەویدایە تەسبیحاتی ئەو خودایە دەکات کە خاوەنی هەمو شتەو بێ عەیبەو دەسەڵاتدارو کار بەجێیە، لادان لە یاسای خودا دژایەتی ئاشکرای ناوی (حکیم)ی خودایە.

(٢) خۆی ئەو زاتەیە کە لەناو نەخوێندەواراندا پێغەمبەرێکی لە خۆیان بۆ رەوانەکردن کە نیشانەکانی خودا دەخوێنێتەوە ، بەسەریانداو پاکیان دەکاتەوە لە نەفامیو بت پەرستیو فێری ئەم قورئانەیان دەکات، ئەگەرچی پێش ئەم قورئانە لە سەرگەردانیەکی ئاشکرای وادا بون کەلەدار و بەرد هەیکەلیان دەتاشیوپاشان بەندایەتیان بۆدەکردنو لێیان دەپاڕانەوەو لێیشیان دەترسان؟! هەندێ جاریش لەخورما دروستیان دەکردن خۆ هەرکاتێکیش برسیان ببوایە دەیانخوارد! دەی ئایا ئەمە سەر لێشێوانێکی ئاشکراو رون نیە؟

(٣) خۆ جگە لەوانیش ئەو پێغەمبەرە نیشانەکانی خودا دەخوێنێتەوە بەسەر کەسانێکی تردا کە هێشتا نەگەیشتون بە ئەوانو پاکیان دەکاتەوە لە نەفامیو بت پەرستیو فێری ئەم قورئانەیان دەکات، واتە: بۆ هەمو ئومەتی پێغەمبەرە ﷺ و هەر خوا خۆیەتی دەسەڵاتدارو دانا، ئەبو هورەیرە دەڵێت: {كُنَّا جُلُوسًا عِنْدَ النَّبِيِّ ﷺفَأُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْجُمُعَةِ وَآخَرِينَ مِنْهُمْ لَمَّا يَلْحَقُوا بِهِمْ قَالَ قُلْتُ مَنْ هُمْ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَلَمْ يُرَاجِعْهُ حَتَّى سَأَلَ ثَلَاثًا وَفِينَا سَلْمَانُ الْفَارِسِيُّ وَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺيَدَهُ عَلَى سَلْمَانَ ثُمَّ قَالَ لَوْ كَانَ الْإِيمَانُ عِنْدَ الثُّرَيَّا لَنَالَهُ رِجَالٌ أَوْ رَجُلٌ مِنْ هَؤُلَاءِ / متفق عليه/ لەخزمەت پێغەمبەردا ﷺ دانیشتبوین کە سورەتی جومعەی بۆدابەزی کە﴿وەجگە لەوانیش کەهێشتا بەوان نە گەیشتون﴾ی تێدابو، ئەڵێ وتم: کێن ئەوانە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ؟ جا وەڵامی نەدایەوە هەتا سێ جار پرسیاری کرد وسەلمانی فارسیمان تێدا بو، جا پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی لەسەر سەلمان داناو پاشان فەرموی: ئەگەر ئیمان لەلای سورەیا بێت پیاوانێك یان پیاوێك ئالەمانە پێی دەگات}

بەڵێ وڵاتی فارس جێگای پیاوانێکی بەرز بوە، وەك ئیمامی مسلم کە خەڵکی نەیشابورەو ئیمامی ئەبوداود خەڵکی سەجستانەو ئیمامی تورمزی وئەبو حەنیفەو بوخاریو نەسائیوسەدانی تر کە هەڵگرانی چرای ئەم ئایینە بونو هەتا قیامەت خەڵك سود لەوان وەردگرێت لە هەمو بوارەکاندا، راستت فەرموە ئەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ .

(٤) ئەوەش چاکەی خودایە دەیدات بە کەسێك کە ئارەزوی لێ بێت، خوا خاوەنی چاکەی گەورەیە لەوانە پێغەمبەرایەتی محمد ﷺ ی کوڕی عەبدوڵای مەکەیی قورەیشی عەرەبیە بۆئەم ئومەتە، ئەگەر ئەم ئومەتەیش سوپاسی ئەم چاکە گەورەی خوایان بکردایە بەم رۆژە نەدەگەیشتن، کە هەمو کەس چاوی تێمان بڕیوە وسەروەتو سامانمان بخۆنو خۆشمان سوكو بێ نرخ بکەن، ئینجا خوا باسی ئەو کەسانەی وەك ئێمە دەکاتو دەفەرموێ:

(٥) وێنەی ئەو کەسانەی کە تەوراتیان پێ هەڵگیراو پاشان بەو ئەرکەی کە تەورات داوای لێکردوبون هەڵنەسان، وەکو وێنەی کەرێکەو باری پەڕاوی هەڵگرتبێت هەر چۆنێك ئەو کەرە سود لەو پەڕاوانە وەرناگرێت ئەوانیش هاوشێوەی ئەو کەرەن، ئەمە وێنەیە بۆ ئەو کەسانەی کە گوێ بە یاسای خوا نادەن، بۆیە دەفەرموێ: وێنەی ئەو گەلەی کە باوەڕیان نەهێناوە بە نیشانەکانی خودا زۆر خراپەو خوایش گەلی ستەمکار رێنمایی ناکاتو نایخاتە ڕیزی خۆشبەختانەوە.

(٦) ئەی محمد ﷺ بەوانەی کە جولەکەن بڵێ: ئەگەر ئێوە وا گومان دەبەن کە ئێوە دۆستانی خودان نە خەڵکی تر دەی داوای مردن بکەن با زوو بگەنەوە بە خواو بەو نازو نیعمەتەی کە بۆی داناون ئەگەر راست دەکەن.

ئەوان هەرگیز ئاواتی مردن ناخوازن، چونکە ئەوەندە خراپەیان کردوە جگە لە سزا چاوەڕوانی شتی تر ناکەنو خوایش زانایە بە کارو پیشەی ستەمکارانو زۆرنابات دەیانکێشێتە دادگاو سزای شیاوبەخۆیانیان بەسەردادەدات. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەکرداربەشی ئیمانە، خۆ ئەمانە باوەڕیان بەخواو

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَۚ ذَٰلِكُمۡ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩﴾ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرٗا لَّعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠﴾ وَإِذَا رَأَوۡاْ تِجَٰرَةً أَوۡ لَهۡوًا ٱنفَضُّوٓاْ إِلَيۡهَا وَتَرَكُوكَ قَآئِمٗاۚ قُلۡ مَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ مِّنَ ٱللَّهۡوِ وَمِنَ ٱلتِّجَٰرَةِۚ وَٱللَّهُ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١﴾

## سُورَةُ المُنَافِقُونَ ٦٣ — ١١

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ﴿١﴾ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّهُمۡ سَآءَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٢﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ فَطُبِعَ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ فَهُمۡ لَا يَفۡقَهُونَ ﴿٣﴾ ۞وَإِذَا رَأَيۡتَهُمۡ تُعۡجِبُكَ أَجۡسَامُهُمۡۖ وَإِن يَقُولُواْ تَسۡمَعۡ لِقَوۡلِهِمۡۖ كَأَنَّهُمۡ خُشُبٞ مُّسَنَّدَةٞۖ يَحۡسَبُونَ كُلَّ صَيۡحَةٍ عَلَيۡهِمۡۚ هُمُ ٱلۡعَدُوُّ فَٱحۡذَرۡهُمۡۚ قَٰتَلَهُمُ ٱللَّهُۖ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴿٤﴾

بەزیندوبونەوەو بەحیساب هەبوە بەشایەتی خودا کەچی خوا خۆی بەکافریان نادەبات.

﴿٨﴾ ئەی محمد ﷺ بڵێ: بێگومان ئەو مردنەی کە ڕادەکەن لە دەستی ئەوسا بەدڵنیاییەوە توشتان دەبێتو دەمرن، پاشان دەتانگێڕنەوە بۆ لای زانای نادیارو دیار، ئەوسا پێتان دەڵێت چیتان کردوەو دەبێت تاڵاوی کردارەکانتان دەردخوارد بدات. عەبدولای کوڕی مەسعود دەڵێت: {خَطَّ النَّبِيُّ ﷺ خَطًّا مُرَبَّعًا وَخَطَّ خَطًّا فِي الْوَسَطِ خَارِجًا مِنْهُ وَخَطَّ خُطَطًا صِغَارًا إِلَى هَذَا الَّذِي فِي الْوَسَطِ مِنْ جَانِبِهِ الَّذِي فِي الْوَسَطِ وَقَالَ هَذَا الْإِنْسَانُ وَهَذَا أَجَلُهُ مُحِيطٌ بِهِ أَوْ قَدْ أَحَاطَ بِهِ وَهَذَا الَّذِي هُوَ خَارِجٌ أَمَلُهُ وَهَذِهِ الْخُطَطُ الصِّغَارُ الْأَعْرَاضُ فَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا وَإِنْ أَخْطَأَهُ هَذَا نَهَشَهُ هَذَا/ البخاري} پێغەمبەر ﷺ هێڵێکی چوارگۆشەی کیشاو هێڵێکیشی بەناوەراستیا هێنا کە دەرچو لەچوار گۆشەکەو چەندین هێڵی بچوکی لەتەنشتی هێڵە ناوەراستەکەوە کێشا و فەرموی: ئەمەی ناو چوار گۆشەکە مرۆڤەوئەم هێڵەی چواردەوری ماوەکەیەتی ﴿ٱلۡأَجَل﴾ کە چواردەوری داوەو لێی دەرناچێت، ئەم هێڵەش کە دەرچوە ئاواتەکانیەتیو ئەم هێڵە وردانەش روداوەکانە ئەگەر یەکێکیان نەیگرێتەوە ئەوی تریان دەیقۆزێتەوە}

﴿٩﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕدارن هەر کاتێك بانگکران بۆ نوێژی جومعە، ئەوسا بەرەو نوێژی جومعە برۆنو واز لە مامەڵە بهێنن ئەوە باشترە بۆتان ئەگەر بزانن، ڕۆژی جومعە کە جەژنی موسڵمانانە ڕۆژێکی پیرۆزە کە پێغەمبەرمان لەبارەیەوە دەفەرموێ:{إِنَّ مِنْ أَفْضَلِ أَيَّامِكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فِيهِ خُلِقَ آدَمُ عَلَيْهِ السَّلَام وَفِيهِ قُبِضَ وَفِيهِ النَّفْخَةُ وَفِيهِ الصَّعْقَةُ فَأَكْثِرُوا عَلَيَّ مِنْ الصَّلَاةِ فَإِنَّ صَلَاتَكُمْ مَعْرُوضَةٌ عَلَيَّ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَكَيْفَ تُعْرَضُ صَلَاتُنَا عَلَيْكَ وَقَدْ أَرَمْتَ أَيْ يَقُولُونَ قَدْ بَلِيتَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَدْ حَرَّمَ عَلَى الْأَرْضِ أَنْ تَأْكُلَ أَجْسَادَ الْأَنْبِيَاءِ عَلَيْهِمْ السَّلَام/ النسائي، صحجه الألباني/} بەڕاستی لە چاکترین ڕۆژەکانتان ڕۆژی جومعەیە، کە لەو ڕۆژەدا ئادەم (سەلامی خوای لەسەر بێت) دروستکراوەو لەو ڕۆژەش دا مردوەو لەو ڕۆژەدا فودەکرێت بە کەڵەشاخداو دەنگە گەورەکەش هەرلەو ڕۆژەدا دەبێ، جا لەوڕۆژەدا سڵاواتی زۆرم لەسەر بدەن بەبێگومان ئەو سڵاواتانەی ئێوەم پیشان دەدرێت، وتیان: چۆن ئەوسڵاواتانەی ئێمەت پیشان دەدرێت خۆتۆ دەرزیەیت؟ فەرموی: بێگومان خوای دەسەڵاتداری گەورە قەدەغەی کردوە لەسەر زەوی کەلاشەی پێغەمبەران بخوات}

وەلە فەرمودەی تردا هاتوە کە لەو ڕۆژەدا خوا ئاسمانانو زەوی دروستکردوەو لەو ڕۆژەشدا ئادەم خرایە بەهەشتەوەو هەر لەو ڕۆژەشدا دەرهێنراوە، وەلەو ڕۆژەدا قیامەت دێتو لەو ڕۆژەدا کاتێك هەیە ئەگەر کەسێك دوعای تێدا بکات بۆ چاکەی دنیاو دوارۆژ دوعاکەی لێوەردەگیرێت کە لەبارەی ئەمانەوە فەرمودەی سەحیح هەیە. ئەم ڕۆژە ئەوندە لای خوا گەورەیە کە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: {مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلَّا وَقَاهُ اللَّهُ فِتْنَةَ الْقَبْرِ / الترمذي، حسنه الألباني/} هەر موسڵمانێك لەرۆژ یان شەوی جومعەدا بمرێت خوا لەتاقی کردنەوەی گۆڕ دەیپارێزێت}

﴿١٠﴾ جا هەر کاتێك نوێژی جومعە تەواوبو، ئەوسا بۆ خۆتان بەسەر زەویدا بلاوەی لێ بکەنو بەشوێن چاکەی خوادا برۆنو یادی خودا بەزۆری بکەن بەڵکو خوا لە سزای دنیاو دوارۆژ ڕزگارتان بکات. گەلێك فەرمودە لە بارەی گەورەیو ڕێزلێگرتنی ڕۆژی جومعەوە هاتوە لەوانە ئەمەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {مَن تَوَضَّأَ يومَ الجُمُعَةِ فأحسَنَ الوُضوءَ ثُمَّ رَاحَ إلَى الجُمُعَةِ فَاستَمَعَ وَأنصتَ غَفَرَ اللهُ لَهُ مَا بَينَ الجُمُعَةِ إلَى الجُمُعَةِ وَزِيَادَةَ ثَلاثَةِ أيَّامٍ. وَمَن مَسَّ الحَصَى فَقَد لَغَا/مسلم/} هەر کەسێك ڕۆژی جومعە دەستنوێژێکی چاك بگرێت، پاشان بچێت بۆ جومعە جا گوێ لە ئیمام بگرێتو بێدەنگ بێت خوا لە گوناهی نێوان ئەم جومعە بۆ جومعەی داهاتویو سێ ڕۆژ زیاتریش چاوپۆشی لێدەکات. هەر کەسێك دەست لە بەرد بدات بۆ چاك کردنی جێگەی سەری ئەوە ئیشی بێسودی کردوە}وەدەفەرموێ: {مَنْ تَرَكَ الْجُمُعَةَ ثَلَاثَ مِرَارٍ

مِنْ غَيْرِ عُذْرٍ طَبَعَ اللَّهُ عَلَى قَلْبِهِ / أحمد، صححه الألباني/ هەرکەسێك سێ جومعە لەسەریەك بەبێ بەهانەیەکی شەرعی جومعە نەکات خوا دڵی مۆردەکات} بەداخەوە ئێمەی موسڵمان شتێك کە جێگای دڵخۆشیمانەو هێشتا وەکو دروشمێکی ئەم ئایینە پیرۆزە ماوەتەوە نوێژی جومعەو جەماعەتە ئەویشمان پڕکردوە لە بیدعەو زۆربەی سونەتەکانمان پشتگوێ خستوە، هاتو هاواری نوێژکەران لەکاتی دوعای ئیمامو هەنگاونان بەسەر یەکتردا بۆ ڕیزی پێشتر گوایە بۆ چاکەی زیاتر نازانن تاوانەکەی زیاترە لە چاکەکەی، وە دەیان شتی تر لێرەدا باسی بکەین شتەکەمان لێ درێژتر دەبێتەوە، ئەی موسڵمانان بگەڕێنەوە بۆ پەیڕەویکردنی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ ئەوەی دەتوانن ئەنجامی بدەن و زیادەو تێهەڵکیش مەهێنن بۆ ئەم ئایینە، چونکە ئەوەی کەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ دین نەبووبێت هەتا قیامەت دین نیەو بەناو دینەوە تاوان دەکات نەچاکەو خێر (بیر بکەرەوە).

(١١) خۆ هەر کاتێك بازرگانیە یان گەمەیە دەبینن بۆی دەردەچنو تۆ بە پێوە بەجێ دەهێڵن بڵێ: ئەوەی لەلای خودایە لە پاداشتو ڕێز بۆتان باشترە تا ئەو بازرگانیەو خوا چاکترینی ڕۆزیدەرانە. لە بارەی دابەزینی ئەم ئایەتەوە ئیمامی بوخاری بۆی هێناوین لە جابیرەوە کە وتی: کاتێك کە ئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ نوێژمان دەکرد لەو کاتەدا قافڵەیەك وشتر کە باریان خۆراك بو هاتو خەڵکەکە دەرچونو پێغەمبەر ﷺ خۆیو دوانزە کەس مانەوە، جا ئەم ئایەتە دابەزیو سەرکۆنەی ئەوانەی کرد کە پێغەمبەریان ﷺ بەجێ هێشتو بەرەو ئەو قافڵەیە ڕۆیشتنو پاشان گەڕانەوە. ئەوە جارێك ڕویدا بو ئەوان جا ئەوەیان لەسەر دابەزی ئەی چەند جار ئێمە گوێمان بە فەرمانی ئەو نەداوەو بەرەو ئەملاو ئەولا ڕۆیشتینو هەندێکمان مردنو هەر نەگەڕانەوە، دەبێ چیمان پێ بوترێتو چ سزایەکمان بۆ ئامادە کرابێت.(پەنابەخوا)

## ٦٣ سورەتی مونافقون ١١

سورەتی مونافقون کە سورەتی شەستو سێ هەمی قورئانە، کەبە کۆی دەنگ لە مەدینەدا هاتوتە خوارەوە، یانزە ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سەدو دووهەمەو پاش سورەتی (الحج) و پێش (المجادلة) دابەزیوە.

لە سورەتی پێشودا باس لە هەڵسوکەتی باوەڕداران کرا وەلەم سورەتەش باس لە مونافقەکان دەکات، جا پێغەمبەر ﷺ ئەم دوو سورەتەی واتە سورەتی "الجمعە" وە " المنافقون"ی لە نوێژی جومعەدا دەخوێند، تا هەم باوەڕدانی ئامۆژگاری کردبێتو هەم مونافقەکانیشی ترساندبێت، هەروەها وازهێنان لە نوێژی جومعە نیشانەی دڵانێکە کە مۆر کراون کە لەم سورەتەش دا باسیان هاتوە.

هۆی دابەزینی ئەم سورەتە ئەو قسە ناشیرینانەی عەبدوڵای کوڕی ئوبەی بو کە قورئان خۆی بۆی تۆمار کردوین، ئەم پیاوە سەرۆکی مونافیقەکان بو، زەیدی کوڕی ئەرقەم کەئەم قسانەی لێ بیست بۆ پێغەمبەری ﷺ گێڕایەوەو پێغەمبەریش ﷺ بانگی کردو عەبدوڵا سوێندی خوارد کە قسەی وای نەکردوە، پێغەمبەر ﷺ لەبەر سوێندەکە باوەڕی بە عەبدوڵا کرد و زەیدی بە درۆزن زانی کە زەید بەمە زۆر نارەحەت بو، تا خوا ئەم سورەتەی ناردو ڕاستی زەید دەرکەوتو پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمو: {إِنَّ اللَّهَ قَدْ صَدَّقَكَ/ متفق عليه/ بێگومان ﷲ ڕاستگۆیی تۆو درۆزنی ئەوانی دەرخست} کە سیرەت نوسان قسە ناشیرینەکانی عەبدوڵایان باسکردوە کەڕوداوەکەش لەسەر دوو کەس بوە یەکێك لە کۆچەریان بەناوی جەهجاهی کوڕی ئوسەیدەو ئەوی تریان ئەنسارێکە بەناوی جوهەنیەوەو باسەکە بەناوبانگەولەکاتی تەفسیری ئایەتەکاندا ڕۆشنتر دەبێتەوە.

بەناوی ﷲی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) هەر کاتێك دووڕوەکان هاتنە لاتو وتیان: شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت ﷺ و خواش دەزانێت کە بێگومان تۆ پێغەمبەری ئەویتو خوا شایەتی دەدات کە بێگومان دووڕوەکان لەو دەرخستنی باوەڕەدا درۆ دەکەنو باوەڕیان نیەو تەنها بۆخۆپاراستن ئەوقسەیەدەکەن.

لێرەش دەر دەکەوێت کە دان پێدا نانی دڵ مەرجی ڕاستبونی بیروباوەڕە ئەگینا ئەوان بەدەم وتیان:( شایەتی دەدەین کە تۆ پێغەمبەری خوایت ﷺ )

(٢) ئەم سوێندانەی خۆیان کردوە بە سپێر تا بەو سوێندە خۆیان لەناو باوەڕداراندا بشارنەوە، ئەوسا لەناوخۆدا ڕێگا لە بڵاوبونەوەی ئایینی خوا بگرن، بێگومان ئەوان کرداری خراپو ناپەسەند دەکەن، زیانی ئەمانە بۆئایین لە هەمو خوانەناسەکانی تر پڕ مەترسیو خراپترە بۆیە خوا جێگای ئەوانەی لەلا خواروی دۆزەخ داناوە. ﴿ بێگومان مونافقان لەپلەی هەر خواروی ئاگری دۆزەخدان﴾ نیساء/١٤٥.

(٣) ئەوەش لەبەر ئەوەیە چونکە بێشك ئەوان بە ئاشکرا باوەڕیان هێناوەو پاشان پاشگەزبونەوە (بەو قسەی کە وتیان: ئێمە خاوەن دەسەڵاتو بە هێزین، محمد ﷺ و یارەکانی بێ دەسەڵاتو ناتەواون کە لەپاشاندا ئەم قسەیان لێ ئاشکرا دەکات) جا دڵیان مۆرکرا ئەوسا ئیتر ئەوان هیچ نافامنو لە هیچ تێناگەن.

وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا يَسْتَغْفِرْ لَكُمْ رَسُولُ اللَّهِ لَوَّوْا رُءُوسَهُمْ وَرَأَيْتَهُمْ يَصُدُّونَ وَهُم مُّسْتَكْبِرُونَ (٥) سَوَاءٌ عَلَيْهِمْ أَسْتَغْفَرْتَ لَهُمْ أَمْ لَمْ تَسْتَغْفِرْ لَهُمْ لَن يَغْفِرَ اللَّهُ لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ (٦) هُمُ الَّذِينَ يَقُولُونَ لَا تُنفِقُوا عَلَىٰ مَنْ عِندَ رَسُولِ اللَّهِ حَتَّىٰ يَنفَضُّوا وَلِلَّهِ خَزَائِنُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَفْقَهُونَ (٧) يَقُولُونَ لَئِن رَّجَعْنَا إِلَى الْمَدِينَةِ لَيُخْرِجَنَّ الْأَعَزُّ مِنْهَا الْأَذَلَّ وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ الْمُنَافِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ (٨) يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُلْهِكُمْ أَمْوَالُكُمْ وَلَا أَوْلَادُكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ (٩) وَأَنفِقُوا مِن مَّا رَزَقْنَاكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَا أَخَّرْتَنِي إِلَىٰ أَجَلٍ قَرِيبٍ فَأَصَّدَّقَ وَأَكُن مِّنَ الصَّالِحِينَ (١٠) وَلَن يُؤَخِّرَ اللَّهُ نَفْسًا إِذَا جَاءَ أَجَلُهَا وَاللَّهُ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (١١)

٦٤ سُورَةُ التَّغَابُنِ ١٨

(٤) خۆ هەر کاتێك چاوت پێیان بکەوێت سەرت سوورِدەمێنێت لە لەش‌و لۆریان‌و سەرو سیمایان، جا ئەگەر قسەش بکەن گوێ دەگری لە قسەیان، چونکە قسەی قەڵەو وپڕ بەدەم‌و جوان دەکەن، یان کە قسەیان کرد تێدەگەیت کە چەند ڕواڵەت کولۆفت‌و بەبەژن‌و بالاو ناو خالێن هەروەکو ئەوەی دارێکی بێ ریشك بن، پاڵ درابن بە دیوارێکدا، ئەمانە ئەوەندە ترسنۆکن (هەر لەبەر ترسنۆکیش بون بە دووڕو) هەر دەنگێك بێت وا دەزانن ئەوە دژی ئەوانە، ئەوانە دژمنن سا خۆتیان لێ بپارێزە، خوا لەناویان ببات، چۆن ئاوەها لادراون لە ڕێگەی ڕاست. جا کاتێك خوا درۆزنی ئەو دووڕوانەی دەرخست، موسڵمانان پێیان وتن: بچن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ و داوای لێبوردنی لێ بکەن، بەڵکو ئەویش داوای لێخۆشبونتان بۆ بکات لە خوا، ئەوان گاڵتەیان بەوقسانە دەکرد، وەك دەفەرموێ:

(٥) جا هەر کاتێك پێیان بوترایە: وەرن تا پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێخۆشبونتان لە خوا بۆ بکات سەریان بادەداو دەتبینی کە خۆیان لەو قسە لادەداو فیزیان دەنواندو بەلایانەوە عەیب بو ئەوکارەبکەن، جا لەتۆڵەی ئەولوت بەرزی‌و قسە ناپەسەندانەیاندا ﷻ لێیان تورِەیەو دەفەرموێ:

(٦) بۆ ئەوان یەکسانە چ داوای لێخۆشبونیان بۆ بکەیت یان داوای لێخۆشبونیان بۆ نەکەیت، هەرگیز خودا لێیان خۆش نابێ.

(٧) چونکە هەر ئەوان بون کە بە خەڵکی مەدینەیان دەوت ئێوە ئیتر شت مەدەن بەو کەسانەی کە لەلای پێغەمبەری خوادان ﷺ، تا ئەوانیش ڕابکەن‌و دەوری پێغەمبەر ﷺ چۆڵ بکەن، خواش دەفەرموێ: گەنجینەکانی ئاسمانان‌و زەوی هەر بە دەست خودایەو ئەو ڕۆزی کۆچەرییەکان دەدات نەك خەڵکی مەدینە بەڵام دووڕووەکان لە هیچ تێناگەن.

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {خَصْلَتَانِ لاَ يَجْتَمِعَانِ فِي مُنَافِقٍ حُسْنُ سَمْتٍ وَلاَ فِقْهٌ فِي الدِّينِ/الجامع الصغير، صححه الألباني/ دوو سیفەت هەیە کە لە مونافقدا کۆ نابنەوە سەروسیمای جوان‌و شارەزابون لەئایین} ئەگەر لایەکیانی تێدابێت ئەوی تریانی تێدا نیە.

(٨) کەئەوان دەڵێن: ئەگەر گەڕاینەوە بۆ مەدینە بە خوا بەهێزەکان (کە مەبەست خۆیان بو) لاوازەکان ( کەمەبەستیان پێغەمبەر ﷺ و یارەکانی بو) لەو شارەدا دەردەکات، خواش دەفەرموێ: دەسەڵاتی بێ چەندو چۆن تەنها هی خودایەو بەهۆی ئەویشەوە هی پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ و لەڕێگەی ئەویشەوە هی باوەڕدارانە بەڵام دووڕووەکان هیچ نازانن. وەك لەسەرەتای سورەتەکەوە هێمامان کردە لای، دەڵێن: کاتێك پێغەمبەر ﷺ ئاگادار بویەوە کە جولەکەکانی "بني المصطلق" خۆیان ئامادەکردوە بۆ هێرش کردنە سەر موسڵمانان، جا پێغەمبەر ﷺ دەست پێشخەری کردو هێرشی کردە سەر ئەوان‌و شەڕەکە لە ناوچەیەك کە بە " موورەیسیع " ناودەبرا ڕویداو جولەکەکان شکستیان خوارد، جا لەو غەزایەدا لە نێوان یەکێك لە موهاجیرەکان‌و یەکێك لە ئەنصاریەکان ناکۆکی‌و دەمەقاڵەیەك دروست بو، جا هەر کامیان هاواریان کردو ئەنصاریەکە هاواری کرد ئەی گەلی ئەنصار یارمەتیم بدەن، موهاجیرەکەیش هاواری لە موهاجیرەکان کرد ئەی موهاجرین یارمەتیم بدەن، جا پێغەمبەر ﷺ کەئەمەی بیست دڵی ناڕەحەت بو فەرموی:{دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ/ واز بهێنن لەم جۆرە هاوارکردنانە کە بەراستی ئەو جۆرە هاوارو بانگ کردنە بۆگەنە} بەڵام عەبدەڵاهی کوڕی ئوبەی کە سەرکردەی مونافقان بو، کە لەم ڕوداوە ئاگادار بویەوە بەهەلی زانی بۆ ڕژاندنی ژەهری ناودەرونی‌و وتی: کاری ئەو کۆچکەرانە گەیشتوە بەجێگایەك کە ئاوا دەکەن بەئێوە با بگەڕێینەوە بۆ مەدینە سوێند بێت ئەوانەی کە بەهێزو گەورەن دەبێ زەلیل‌و داماوەکان لە مەدینەدا دەربکەن، لە ڕاستیشدا هەر خەتای خۆتان بو ئاوا ئەوانتان لەوڵاتی خۆتاندا جێداو لە ماڵی خۆتان بە ئەوانتان بەخشی وتی: ئەوەی کەروی داوە وەك ئەو قسەیە کەدەڵێن:"سەگەکەت قەڵەوبکە تابتخوات" جا لەمەولا

ئیتر هیچیان پێمەدەن، ئەگەر واتان کرد بەدڵنیاییەوە وازمان لێدەهێنن‌و دەڕۆن بۆ شوێنێکی تر،

زەیدی کوڕی ئەرقەم ئەو قسانەی گێڕاوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، جا عومەری کوڕی خەتاب وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ رێم پێبدە کە لەملی ئەومونافقە بدەم، پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {دَعْهُ لَا يَتَحَدَّثُ النَّاسُ أَنَّ مُحَمَّدًا يَقْتُلُ أَصْحَابَهُ/ متفق عليه/ وازی لێ بهێنە نامەوێ خەڵك بڵێن کە محمد یارەکانی خۆی دەکوژێت}

ئینجا پێغەمبەر ﷺ بانگی عەبدوڵای کردو لەو بارەوە پرسیاری لێکردوئەوویش سوێندی خوارد کە شتی وای نەوتوە، پاشان اللَّه ﷻ ئەم ئایەتانەی ناردەخوارەوەو راستی زەیدی سەلماندن‌و ئابڕوی دووڕوەکانی برد. ئینجا خوا بانگی باوەڕداران دەکات کە با بەخۆیاندا بچنەوەو هەوڵی یارمەتیدانی یەکتر بدەن، با لە منەتی دووڕوەکان دەربچن‌و دەفەرموێ:

(٩) ئەی باوەڕداران با نە سەروەت‌و سامانتان‌و نە فەرزەندانتان لە یادی خوا کە جیهادو غەزا بەشێکی گەورەن لەویادەی اللَّه ﷻ بێ ئاگاتان نەکەن، چونکە هەر کەسێك وای لێبێت کە سەروەت‌و سامان یان فەرزەندانی لە غەزاو یادی خوا بێ ئاگای بکات، ئەوسا ئەوانە هەر خۆیانن دۆڕاوو ڕەنجەڕۆن،

(١٠) دەی لەو ماڵەی کە پێم بەخشیون ئێوەش ببەخشن بۆ بەرزکردنەوەی ئایینی خودا پێش ئەوەی مردن یەخەتان بگرێت، جا ئەوسا دەڵێت: پەروەردگارم ئای کەمێك ماوەت پێبدامایە، جا ئەو کاتە چاکە دەکەم‌و دەبم بە یەکێك لە پیاوچاکان؛ پاش چی؟ تازە ناگەڕێیتەوەو ئەوەی کۆتکردەوە خەڵکی تر بۆت دەخۆن‌و حیسابیشی لەسەر تۆیە، ئەی قورت بەسەر بۆ بیر لە خۆت‌و پاشەڕۆژت ناکەیتەوە تا مردن یەخەی نەگرتویت، بەراستی ئەم قورئانە هەتا زەمانی زیاتری بەسەردا بڕوات تازەتر دەبێتەوە، ئەم ئایەتانە ئەڵێیت بۆ چارەسەری گرفتارییەکانی ئەم سەردەمەی موسڵمانانە کە بە هۆی ناوە دەستکردەکانەوە پارچە پارچە بوون‌و هیچ کەس بەربەی ئەوی تر ناپێویت‌و لەبەر کورسی شەقوشەڕی دنیایی‌و کۆ کردنەوەی پارەی حەرام وەك ئاغاکانی کۆن هەر فێڵزان‌ولێزانێ بۆ ژیانی دنیای خۆی کۆمەڵێ خەڵکی بۆخۆی بەناوی جۆراوجۆرەوە پێك هێناوەوخواو قیامەت‌و ویژدانی وەلا ناوەونابێ کەسیش پێیان بڵێت لەسەر چاوتانەوە برۆ هەیە؟! کام ناو لەوناوانەی جەنابتان لەوشەی مهاجرو ئەنصار پیرۆزترە کەمادام بۆنی دووبەرەکی لێ هات پێغەمبەرمان فەرموی: {دَعُوهَا فَإِنَّهَا مُنْتِنَةٌ/ متفق عليه/ واز بهێنن لەم جۆرە هاوارکردنانە کە بەراستی بۆگەنن}

دەبیر بکەنەوەو لەخوا بترسن‌و کەم خەڵکی موسڵمانی فەقیر بەناوی دینەوە بۆخزمەتی خۆتان بەناوی جواراوجۆرەوە فریو بدەن بۆ دنیا، دنیا بۆ کەس تاسەر نیەو کورسی بۆ کەس نامێنێ، خۆ ئەگەر کورسی‌و پلەو گەورەیی بۆخەڵك بمایە ئەمرۆ نەدەگەیشتە دەس تۆ، وای چەند چەواشەو چەند چەواشەکاری!!

(١١) خۆ هەرکەسێك کە کاتی مردنی هات هەرگیز خودا ماوەی ژیانی پێنادات و خوا زۆر بەئاگایە لەوەی کە ئێوە دەیکەن‌و هەر کەسێك بەگوێرەی کرداری خۆی ڕەفتاری لەگەڵدا دەکات‌و ستەم لە کەس ناکات.

## سورەتی تەغابون ٦٤ ١٨

سورەتی تەغابون کە سورەتی شەست‌و چوارەمی قورئانە، زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، هەژدە ئایەتە، یەکێکە لە سورەتەکانی "الْمُسبِّحات". ئەم سورەتە تەنها بە سورەتی " التغابن" دەناسرێت‌و ئەم وشەیەش تەنها لەم سورەتەدا هاتو، وتراوە بەگوێرەی دابەزینی سەدەمین سورەتەو لە پاش سورەتی (جومعە)و پێش سورەتی (صەف) دابەزیوە، لە ئاخرین ئایەتەکانی سورەتی پێشو کە سورەتی " المنافقون" بو باس لەوانە کرا کە دەستیان لە رێی خودا نەبووەو زەکاتی ماڵیان نەداوە تا ئەوکاتەی کە مردن یەخەیان پێدەگرێت، ئینجا پەشیمانی رویان تێدەکات‌و دەزانن توشی چ ڕەنجەڕۆی‌و زیانێك بوون، جا ئەم سورەتەش کە ناوی " التغابن" ـە کە واتە زیان‌و هەڵشکان، باس لە ڕەنجەڕۆی مرۆڤ دەکات لە

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يُسَبِّحُ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۖ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ ۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١﴾ هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ فَمِنكُمْ كَافِرٌ وَمِنكُم مُّؤْمِنٌ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢﴾ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ بِالْحَقِّ وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ ۖ وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ ﴿٣﴾ يَعْلَمُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ۚ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٤﴾ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَأُ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن قَبْلُ فَذَاقُوا وَبَالَ أَمْرِهِمْ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُ كَانَت تَّأْتِيهِمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَقَالُوا أَبَشَرٌ يَهْدُونَنَا فَكَفَرُوا وَتَوَلَّوا ۚ وَّاسْتَغْنَى اللَّهُ ۚ وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ ﴿٦﴾ زَعَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَن لَّن يُبْعَثُوا ۚ قُلْ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتُبْعَثُنَّ ثُمَّ لَتُنَبَّؤُنَّ بِمَا عَمِلْتُمْ ۚ وَذَٰلِكَ عَلَى اللَّهِ يَسِيرٌ ﴿٧﴾ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالنُّورِ الَّذِي أَنزَلْنَا ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ يَجْمَعُكُمْ لِيَوْمِ الْجَمْعِ ۖ ذَٰلِكَ يَوْمُ التَّغَابُنِ ۗ وَمَن يُؤْمِن بِاللَّهِ وَيَعْمَلْ صَالِحًا يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ۚ ذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾

دوارۆژدا کە چۆن ئەو ماوەی کە پەروەردگار پێیدا بون لە ژیانی دنیا بە باشی بەکاریان نەهێناوە.

بەناوی اللَّه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەوەی کە لەناو ئاسمانەکانەو لەناو زەویدایە هەر هەموی پاکی‌و بێ عەیبی خوا دەڵێن‌و هەر ئەو خاوەنی هەمو شتێکە لە خودی خۆیداو نیازی بە کەس نیەو هەر بۆ ئەوە سوپاسی بێ پایان‌و هەر خۆیەتی توانایی بەسەر هەمو شتێکدا هەیەو هیچ شتێك ناتوانێت لەژێر دەسەڵاتی ئەودا دەربچێت.

(٢) خۆی ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروستکردوە، جا هەندێکتان خوانەناس‌و هەندێکی ترتان باوەڕدار، جا خوا بینەری ئەو شتانەیە کە ئێوە دەیکەن. واتە پەروەردگار مرۆڤەکانی لە دوو بەش دروستکردووە سەرەنجامیشیان لە دوو جیگا دەرناچێت یان بەهەشتی یان دۆزەخی، گرنگیش ئەوەیە کە لە سەرکامیان ئەم دنیایەی بەجێهێشتبێت‌و وەفاتی کردبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ/ متفق عليه} پیاوی وا هەیە کە کردار ئەنجام دەدات کەوا دەر دەکەوێت لەناو خەڵکدا کە کرداری خەڵکی بەهەشتیە، کەچی ئەو ئەهلی دۆزەخە، وە پیاوی واش هەیە کە کردار ئەنجام دەدات کەوا دەر دەکەوێت لەناو خەڵکدا کە کرداری خەڵکی دۆزەخییە، کەچی ئەو ئەهلی بەهەشتە} واتە ئەوە گرنگە کە مرۆڤ لەسەری دەمرێت، لەسەر چی مردیت لەسەر ئەوە حیسابت بۆ دەکرێت.

(٣) کە ئاسمانان و زەوی بۆ مەبەستێکی ڕاست دروست کردووە بێهودەو بێ کەڵك نیەو وێنەی کێشاون، جا سەرو سیمایەکی جوانی پێداون‌و سەرئەنجامیش گەڕانەوە هەر بۆ لای ئەوە بۆ وەرگرتنەوەی پاداشتو سزای کردارەکانتان.

(٤) ئەو دەزانێت بەو شتەی کە لەناو ئاسمانان‌و زەویدایەو دەزانێت چ دەشارنەوەو چ ئاشکرا دەکەن ( پەنهان‌وئاشکرا لەلای خودا وەکو یەك وان)و خودایش زۆر زانایە بەوەی کە لەناو دڵەکاندایەو هیچی لێ حەشار نادرێت. جا اللَّه ﷻ باسی سەرکەشی‌و سەرئەنجامی گەلانی پێشومان بۆ دەکات تا ئێمەش پەندی لێوەربگرین‌و دەفەرموێ:

(٥) ئایا پێتان نەگەیشتوە دەنگوباسی ئەو کەسانەی کە خوانەناس بوون لەپێش ئێوەدا ؟ جا سزای کارەکانی خۆیانیان چەشتو بۆ ئەوان سزای بەژان هەیە، ئەمەش ناحەقیان پێ نەکراوە، کرداری خۆیان یەخەی گرتون.وەك دەفەرموێ:

(٦) ئەوە لەبەرئەوە بو کە بێگومان ئەوان پێغەمبەرانیان بە نیشانە گەلی ڕونەوە بۆ هات، جا ئەوان وتیان: مرۆڤ ڕێنمایی ئێمە دەکات! چۆن شتی وا دەبێت؟! جا ئیتربێباوەڕبون‌و پشتیان لە ئایین کردو خوایش بێنیازە لەوان‌و خوا دەوڵەمەندو سوپاسکراوە،

(٧) خوانەناسان وا گومان دەکەن کە هەرگیز زیندوبونەوەیان نیە، بڵێ: نەخێر وانیەو گومانەکانتان ڕاست نیە بە پەروەردگارم قەسەم زیندو دەکرێنەوە، پاشان هەواڵتان پێدەدرێت کە چیتان کردوە، خۆ ئەوەش لەلای اللَّه کارێکی ئاسانە، ئەمە ئایەتی **سێهەمە** کە خوا فەرمان دەدات بەسەر پێغەمبەردا ﷺ کە سوێند بخوات کە زیندوبونەوە هەیە. ئایەتی **یەکەم**: لە سورەتی (یونس:٥٣) دابو کە فەرموێ:﴿ لێت دەپرسن ئایا ئەو هەواڵی زیندو کردنەوەڕاستە بڵێ: ئەرێ بەخوا، سوێندبە پەروەردگارم هیچگومانی تێدا نیە ئەوەراستی ڕاستە﴾ ئایەتی **دووهەم**: لە سورەتی (سبأ:٣)دابو کە فەرموێ:﴿ جا بێباوەڕان وتیان: قیامەت نایەت بڵێ: وانیە کەئێوە دەڵێن سوێند بە پەروەردگارم زانای نهێنیەکان، بەدڵنیاییەوە قیامەت پێتان دەگات﴾.

(٨) دەی سا باوەڕ بهێنن بە خواوبە پێغەمبەرەکەی ﷺ و بەئەو ڕوناکیەی (کە قورئانە) کە ناردومانە بۆتان‌و خوا زۆر بەئاگایە بەو کارانەی کە ئێوە دەیکەن.

(٩) باس بکە ئەو ڕۆژەی کە هەموتان کۆدەکاتەوە بۆ ڕۆژی کۆبونەوە کە ڕۆژی قیامەتە، کە ئەوە ڕۆژی هەڵشکان‌و پەشیمان بونەوەی مرۆڤەکانە.( ئەو ڕۆژەی باوەڕداران جێگاو هاوسەرانی خوانەناسان لە بەهەشتدا دەبەن، واتە: هەمو پیاوێك لە بەهەشتدا جێگاو هاوسەری هەیە جا ئەگەر باوەڕی هێنا ئەوە دەدرێت بەخۆی، ئەگینا دەدرێت بە باوەڕدارێك لە بەهەشتدا، ئەویش ئاگری دۆزەخ‌و کێم‌و زوخاوی داخی دۆزەخیان نۆش دەکات، جا بەراستی کام پەشیمانی‌و زیان هەیە لەمە گەورەتر؟) خۆ هەر کەسێك باوەڕی بە خوا هێنابێت‌و کرداری چاکی کردبێت خوا خراپەکانی لێ ڕەش دەکاتەوەو دەیخاتە ناو باخچەیانێکەوە کە چەندین جۆگە بەناویدا دەڕوات کەبۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، ئەوەیە سەرکەوتن‌و بەختەوەری گەورە.

(١٠) جا ئەو کەسانەی کە بێباوەڕبوون‌و نیشانەکانی ئێمەیان بە درۆ دادەنا، ئەوانە یارانی ئاگرن کەبۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوەو خراپترین سەرئەنجامە ئەو ئاگرە بۆیان.

(١١) هیچ کەسێك هیچ بەڵایەکی بەسەردا نایەت، تەنها مەگەرخوا ڕێگای پێبداو هەر کەسێکیش باوەڕ بە خوا بکات خواش دڵی ئەو ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست‌و سەرئەنجامیشی خۆشبەختیە، ئەوسا خوا زانیاری بە هەمو شت هەیەو هەمو شت دەزانێت، هیچ شت ڕونادات مەگەر ئەوەی کە لە عیلمی الله دا تێپەڕیبێت‌و ئیزنی لەسەری هەبوبێت، جا ئەو کەسەی کە ئاوا باوەڕێکی بە پەروەردگاری خۆی هەبێت‌و بەقەزاو قەدەری ڕازی بێت ئەوا پەروەردگاریش دڵی فروان دەکات‌و ئەنجامدانی چاکەی بۆ دەڕەخسێنێت.

(١٢) جا پەیڕەوی فەرمانی خودا بکەن‌و پەیڕەوی فەرمانی ئەو پێغەمبەرەی ﷺ ئەو بکەن‌و لە قسەی لانەدەن، ئەوسا ئەگەر پشتتان تێکردو لێی دور کەوتنەوە هەر خۆتان زیان دەکەن، چونکە پێغەمبەرەکەمان ﷺ هەر گەیاندنی ڕون‌و ئاشکرای لەسەرەو خەڵك بە قسەی بکات یان نەیکات ئەو پەیامی خۆی گەیاندوەو بەرپرسێتی لەسەر نەماوە.

(١٣) الله جگە لەخۆی هیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیەو با باوەڕداران هەر تەنها بە خوا پشت ببەستن‌و ڕوو تەنها لەو بکەن چونکە هەرخۆیەتی پشت‌و پەنای باوەڕداران.

(١٤) ئەی ئەوانەی کە باوەڕدارن هەندێك لە هاوسەرەکانتان‌و هەندێك لەمناڵانتان دژمنی ئێوەن‌و ڕێگای جیهادو ماڵ بەخشینتان لێدەگرن (هاوسەری پیاو بێت یان ئافرەت هەردووك

وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِ خَٰلِدِينَ فِيهَاۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ﴿١٠﴾ مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۗ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ يَهۡدِ قَلۡبَهُۥۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ﴿١١﴾ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَإِنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿١٢﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿١٣﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ مِنۡ أَزۡوَٰجِكُمۡ وَأَوۡلَٰدِكُمۡ عَدُوّٗا لَّكُمۡ فَٱحۡذَرُوهُمۡۚ وَإِن تَعۡفُواْ وَتَصۡفَحُواْ وَتَغۡفِرُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴿١٤﴾ إِنَّمَآ أَمۡوَٰلُكُمۡ وَأَوۡلَٰدُكُمۡ فِتۡنَةٞۚ وَٱللَّهُ عِندَهُۥٓ أَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴿١٥﴾ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ﴿١٦﴾ إِن تُقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعِفۡهُ لَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ شَكُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٧﴾ عَٰلِمُ ٱلۡغَيۡبِ وَٱلشَّهَٰدَةِ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿١٨﴾

## ٦٥ سُورَةُ الطَّلَاقِ ١٢

بۆ یەکتر هەندێکیان ئاوەهادەبن‌و ئایەتەکە هەردووك دەگرێتەوە، والله أعلم) سا ئێوە وریابن‌و ئەو هاوسەرو مناڵانتانە فریوتان نەدەن، خۆ ئەگەر چاوپۆشیان لێ بکەن‌و تۆڵەیان لێ وەرنەگرن‌و بیانبەخشن خودا خۆی ئەمەی پێخۆشە، ئەوسا بێگومان کە الله خۆیشی زۆر لێبوردەو میهرەبانە سەبارەت بە بەندەکانی‌و ئەو وەسفەشی پێخۆشە لەناو باوەڕداراندا هەبێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ لَا يَرْحَمْ لَا يُرْحَمْ/البخاري/ ئەوکەسەی کە ڕەحمی نەبێ ڕەحمی پێناکرێت}

(١٥) سامانتان‌و مناڵتان تاقیکەرەوەی ئێوەن (تا دەربکەوێت بۆ هەمو کەس کە ئایا خوداو جیهادو ماڵ بەخشین‌و بەجێهێشتنی مناڵان لەلای ئەو کابرایە گرنگە یان پشتگوێ خستنی فەرمانی خواو جیهادو دەستگرتنەوە لە ماڵ بەخشین‌و هەڵگرتنی بۆ مناڵانی؟!) خودا داوا لە باوەڕداران دەکات کە دژمنانی نزیکی خۆیان‌و تاقیکەرەوەی ناو ماڵی خۆیان بناسن‌و فریویان نەخۆن‌و بە چاکیش لەگەڵ ئەواندا بجوڵێنەوە نەك بە شەڕو قەیوقاڵی هەمیشەیی ناوماڵ‌و مناڵ‌و دەفەرموێ: هەر لای الله خۆیەتی پاداشتی گەورە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ الْوَلَدَ مَبْخَلَةٌ مَجْبَنَةٌ مَجْهَلَةٌ مَحْزَنَةٌ/ أحمد، صححه الألباني/ بەبێگومان کە مناڵ هۆی ڕژدی‌و ترسان‌ونەزانی‌و خەمبارییە}

(١٦) جا لەخوا بترسن‌و بەندایەتی ئەو بکەن بە ئەندازەی توانای خۆتان‌و گوێ بگرن بۆ بیستنی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەی

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا
الْعِدَّةَ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ ۖ لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ
وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ وَتِلْكَ حُدُودُ
اللَّهِ ۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ ۚ لَا تَدْرِي لَعَلَّ
اللَّهَ يُحْدِثُ بَعْدَ ذَٰلِكَ أَمْرًا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ
بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ
وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ
بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ
مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ
بَالِغُ أَمْرِهِ ۚ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ وَاللَّائِي يَئِسْنَ
مِنَ الْمَحِيضِ مِن نِّسَائِكُمْ إِنِ ارْتَبْتُمْ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَاثَةُ أَشْهُرٍ
وَاللَّائِي لَمْ يَحِضْنَ ۚ وَأُولَاتُ الْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ
وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مِنْ أَمْرِهِ يُسْرًا ﴿٤﴾ ذَٰلِكَ أَمْرُ اللَّهِ أَنزَلَهُ
إِلَيْكُمْ ۚ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يُكَفِّرْ عَنْهُ سَيِّئَاتِهِ وَيُعْظِمْ لَهُ أَجْرًا ﴿٥﴾

ﷺ و پەیڕەوی بکەنو ماڵ ببەخشن ئەمە چاکە بۆتان، هەر کەسێکیش خۆی لە ڕژدی بپارێزێت ئەوسا ئەوانە هەر خۆیانن ڕزگار. پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ/ متفق عليه/ هەرکاتێ فەرمانم پێدان بۆئەنجامدانی شتێك ئەوسا بەو ئەندازەی کە دەتوانن لێی ئەنجام بدەن، وە هەر کاتێکیش بەرگریم کردن لە شتێك ئەوسا بە تەواوی وازی لێ بهێنن} هەروەها دەفەرموێ: {لَا يَجْتَمِعَانِ فِي قَلْبِ عَبْدٍ الْإِيمَانُ وَالشُّحُّ / النسائي، صححه الألباني/ لەدڵی هیچ بەندەیەکدا ئیمانو ڕژدی کۆ نابێتەوە}.

﴿١٧﴾ ئەگەر ئێوە قەرزی جوان بە خودا بدەن، ئەو چەند بەرانبەری دەکاتەوە بۆتان لە پاداشتداو لێتان خۆشدەبێتو خوا شایانی سوپاس بۆ کردنەو ئەویش سوپاسی کەسی لەلا ون نابێتو بە حەوسەڵەیەو زوو تۆڵەی تاوانەکان وەرناگرێت، بەڵکو بەندەکانی بیربکەنەوەو لەو تاوانانە پەشیمان ببنەوە. مەبەست لەقەرزدان بەخوا چاکە کردنە لەگەڵ بەندەکانی خوادا، ئەگینا خوا نیازی بە سەروەتوسامانی ئێمە نیە بەڵکو هەرچی سەروەتو سامان هەیە موڵکی خۆیەتیو بەئەمانەت دەیدات بە بەندەکانی.

﴿١٨﴾ ئەوزاتە زانەری پەنامەکیو ئاشکرایە وەك یەك، کە هەر خۆیەتی دەسەڵاتداری ڕەهاو هەموکارەکانی ڕێكو پێكو دانایانەیەو هەموی لە جێگای خۆیدایەو لادان لەهەرگۆشەیەکی شاکارەکانی لەناوبردنو ڕوخانی ژیانی مرۆڤایەتیە کە هەرەس هێنانی جیهانی ئەمڕۆڕۆشنترین بەڵگەیە لەسەر ڕاستی قسەکانمان و دان نەنانە بەزانایىو ئاگایىو دانایی اللَّهُ ﷻ دا جا ئیتر چۆن لاف باوەڕداری بەخوا لێدەدەیت، هەی باوەڕدار؟!

| ٦٥ | سورەتی تەڵاق | ١٢ |
|---|---|---|

سورەتی تەڵاق کە سورەتی شەستو پێنجەمی قورئانە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوەو دوانزە ئایەتە، لە ئیبنو مەسعودەوە هاتوە کە ئەم سورەتەی بە " النِّسَاءُ الْقُصْرَى " ی ناوبردوە، وتراوە نەوەدوشەش هەمین سورەتە بەگوێرەی دابەزینو پاش سورەتی (الإنسان) و پێش سورەتی ( البينة ) دابەزیوە، لە سورەتی پێشودا باسی ئەوەی کرد کە هەندێ لە ژنانتانو منداڵانتان دژمنی ئێوەن جا هەر لەوێدا داوای کرد کە ئەگەر بیانبەخشن ئەوە چاکترە بەڵام ئەگەر وا نەکراو کار بە تەڵاقدانی کێشا ئاگاداربن کەلەو کاتەدا ئەو دژمنایەتیە واتان لێ نەکات کە حەقو دادپەروەریتان لەبیر بچێتەوە بەڵکو دەبێ ئەو ئەحکامانەی کە لەم سورەتەدا هاتون جێبەجێیان بکەن.

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ لێرە ڕوی قسە لە پێغەمبەرە ﷺ و مەبەستی ئومەتەکەیەتی، ئەی پێغەمبەر هەر کاتێك ئافرەتانتان تەڵاقدا با لە عیدەی خۆیاندا تەڵاقیان بدەن، جا عیدە بزانن‌و حیسابی بکەنو لەو خوایە بترسن کە پەروەردگارتانە، جائەو ئافرەتەی کە لە عیدەدان لە ماڵەکەی خۆیان دەریان نەکەنو ئەوانیش بۆ خۆیان دەرنەچن مەگەر ئەو ئافرەتە کاری داوێن پیسی یان ئێشو ئازار بۆ مێرد یان کەس‌وکاری مێردی دروست بکات ئەوانە دەردەکرێن چونکە ئەوخۆی بەوهەڵسو کەوتە ناڕێکەی مافی مێردی کۆنی پێشێل کردوەو مەعقول نیە ئیترمێردی کۆنی هەر یارمەتی بدات، ئەوە سنوری خودایەو هەر کەسێك لەو سنورەی خودا تێ بپەڕێت ئەوسا ئەوە ستەمی لە خۆی کردوە، تۆ نازانی بەڵکو خودا پاش ئەو تەڵاقدانە سەرەتاییە شتێکی تازە بهێنێتە ڕوو کە هەردووکیان پەشیمان ببنەوەو بتوانن بەیەکەوە ئەو ژنو مێردە ژیان ببەنە سەر. لەم ئایەتەدا ئەم حوکامانە باسکران: ئافرەت ئەگەر تەڵاق درا با لە عیدەی خۆیدا تەڵاق بدرێن واتە ئەگەر ئەو ئافرەتە منداڵ یان ئافرەتێك بێت کە عادەی نەبو یان نەیمابو یان هێشتا کابرا پاش مارەبڕین بەتەنهایی لەگەڵیدادانەنیشتبێت ئەو ئافرەتە کە تەڵاق دەدرێت یان سکی هەبێتو دیار بێت یان لە پاکیدا بێتو جیماعی لەگەڵدا نەکردبێت ئەگینا ئەوە عیدەی خۆی نیەو بیدعەیەو ئەو سێ تاقمەی پێشو (ئافرەتی منداڵ یان نائومێد لە عیدە یان

نەگوازراوە) هەر کاتێك تەلاق بدرێن نە بە سوننەو نە بە بیدعە ناو نابرێن، نافیع دەڵێت:{أَنَّ ابْنَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا طَلَّقَ امْرَأَةً لَهُ وَهِيَ حَائِضٌ تَطْلِيقَةً وَاحِدَةً فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺأَنْ يُرَاجِعَهَا ثُمَّ يُمْسِكَهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ تَحِيضَ عِنْدَهُ حَيْضَةً أُخْرَى ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ مِنْ حَيْضِهَا فَإِنْ أَرَادَ أَنْ يُطَلِّقَهَا فَلْيُطَلِّقْهَا حِينَ تَطْهُرُ مِنْ قَبْلِ أَنْ يُجَامِعَهَا فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِي أَمَرَ اللَّهُ أَنْ تُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ / مسلم وغيره/ عەبدوڵای کوڕی عومەر خێزانەکەی یەك تەلاق دا لەحاڵێکدا لە عادەی ئافرەتانەدا بو جا پێغەمبەر ﷺ فەرمانی پێکرد کەبیهێنێتەوە لەپاشان رایگرێت تا پاك دەبێتەوە پاشان جارێکی تر دەکەوێتە عوزرەوە لەپاشان ماوەی پێبدات تا لەو عوزرەی پاك دەبێتەوە ئەوسا ئەگەر ویستی تەلاقی بدات باتەلاقی بدات لەوپاکییەدا پێش ئەوەی کە جیماعی لەگەلدا بکات جا ئەوەیە ئەوعیدەیە کەخوا فەرمانیی داوە کە ژنی تێدا تەلاق بدرێت} وە لە ریوایەتێکی تردا بەم شێوەیە هاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرموی:{فَلْيُرَاجِعْهَا ثُمَّ لِيُطَلِّقْهَا طَاهِرًا أَوْ حَامِلًا/مسلم وغيره/ جاباییهێنێتەوە پاشان تەلاقی بدات کەپاك بێت یان بارداربێت} تەلاقی بیدعی بەلای زۆربەی زانایانەوە دەکەوێت ئەگەرچی تەلاقدانەکەی بەشێوەیەکی شەرعی نەبوە، ئیمەش ئەم رەئیە بە راست دەزانین چونکە هەرکەس بەم شێوەیە خێزانی خۆی تەلاق بدابایەو لەو بارەوە پرسیاری لە عەبدوڵای کوڕی عومەر بکردایە پێی دەوت:{أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَ امْرَأَتَكَ مَرَّةً أَوْ مَرَّتَيْنِ فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺأَمَرَنِي بِهَذَا وَإِنْ كُنْتَ طَلَّقْتَهَا ثَلَاثًا فَقَدْ حَرُمَتْ عَلَيْكَ حَتَّى تَنْكِحَ زَوْجًا غَيْرَكَ وَعَصَيْتَ اللَّهَ فِيمَا أَمَرَكَ مِنْ طَلَاقِ امْرَأَتِكَ / مسلم وغيره/ جا ئەگەر تۆ یەك یان دوو تەلاقی خێزانەکەتداوە ئەوە پێغەمبەر ﷺ بەمە فەرمانی پێکردم (کە لە فەرمودەکەی پێشودا باسکرا )بەلام ئەگەر سێ تەلاقەیە ئەوە ئەو ئافرەتەت لێ حەرام بوە تاکو نەبێت بە خیزانی کەسێکی تر وئەویش تەلاقی بدات وعیدەیشی بڕوات، جا توشی تاوانیش بویت لە سەر سەرپێچی ئەوەی کە ﷻ فەرمانی پێدایت لەو جۆرە تەلاقەی خێزانەکەت} وە حیکمەت لەوەی کە ئافرەت بە شێوەی بیدعی تەلاق نەدرێت بۆئەوەیە کە ئافرەتی تەلاقدراو ماوەیەکی زۆرتر لەوەی کە شەرع بۆی داناوە راگیر نەکرێتو بارداربون یان باردار نەبونی ئەو ئافرەتە دەرکەوێتوشایەت لەو ماوەیشدا هەردووکیان پەشیمان ببنەوە جا بۆیە فەرماندراوە ئەوەی کە بە شێوەی بیدعی ئافرەتەکەی تەلاقداوە بەمەرجێك تەلاقی سێهەم نەبێت با بیگەڕێنێتەوە، هەر بۆیە پێغەمبەر ﷺ راگرتنی ئافرەتەکەی پێش تەلاقدانی دەخاتو دەفەرموێ: {ثُمَّ إِنْ شَاءَ أَمْسَكَ بَعْدُ وَإِنْ شَاءَ طَلَّقَ قَبْلَ أَنْ يَمَسَّ / البخاري/ پاشان ئەگەر ئارەزۆی لێ بوبائیتربیگرێتەوە لەلای خۆی، خۆ ئەگەر ویستیشی پێش ئەوەی کەبچێتە لای باتەلاقی بدات}

ئایەتی دواتریش هەربەم شێوەیە، یەکێکی تر لەو حوکمانەی تەلاق کە لەناوی زانایاندا ناکۆکی لەسەرە تەلاقی سیانە بەیەك جار وەك ئەوەی بەخێزانەکەی بڵێت: ئەوا سێ تەلاقەم دایت، هەندێ لە زانایان پێیان وایە کە ئەم پیاوە هەر سێ تەلاقەکەی کەوتوەو ناتوانێت بیگەڕێنێتەوە مەگەر پاش ئەوەی کە بەنیکاحی شەرعی پیاوێکی تر دەرهاتبێتو پاشان تەلاق درابێت بەلام هەندێکی تر پێیان وایە کە ئەمەش حیسابی یەك تەلاقی بۆدەکرێت جا ئەگەر لەپێشدا هیچ تەلاقی نەکەوتبێت ئەوا بەیەکەم تەلاق حیساب دەکرێت پیاوەکە لەم شێوەدا دەتوانێت خێزانی بهێنێتەوە، ئیبنوعەباس دەڵێت:{طَلَّقَ رُكَانَةُ بْنُ عَبْدِ يَزِيدَ أَخُو الْمُطَّلِبِ امْرَأَتَهُ ثَلَاثًا فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ فَحَزِنَ عَلَيْهَا حُزْنًا شَدِيدًا قَالَ فَسَأَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺكَيْفَ طَلَّقْتَهَا قَالَ طَلَّقْتُهَا ثَلَاثًا قَالَ فَقَالَ فِي مَجْلِسٍ وَاحِدٍ قَالَ نَعَمْ قَالَ فَإِنَّمَا تِلْكَ وَاحِدَةٌ فَارْجِعْهَا إِنْ شِئْتَ قَالَ فَرَجَعَهَا / أحمد. صحح إسناده، أحمد شاكر / روکانەی کوڕی عەبدو یەزیدی برای موتەلیب خێزانەکەی بەیەك جار هەر سێ تەلاقیدا جا زۆر ناڕەحەت بو وتی: پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە پرسیاری لێکرد چۆن تەلاقتداوە؟ وتی: سێ‌وەسێ تەلاقم داوە ئیبنو عەباس وتی: پێغەمبەر ﷺ پرسیاری کرد بەیەکجار؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: لەیەك دانیشتندا؟ وتم: بەڵێ، پێغەمبەرﷺ فەرموی: ئەوە هەر یەکدانەیە ئەگەر دەتەوێ بیگەڕێنەوە، جا ئەویش گەڕاندیەوە} بەلام ئەگەر فرمانڕەوای موسڵمانان کاتێك دی کە خەڵك لەگەڵ ئەحکامەکانی تەلاق بە سوکی هەڵسوکەوت دەکەن بۆ تەمیە کردنیان دەتوانێت ئەمەیان لە سەر تەنگ بکاتەوەو ئەمەش لە سونەدا هاتوە، ئیبنوعەباس دەڵێت:{كَانَ الطَّلَاقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺوَأَبِي بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلَافَةِ عُمَرَ طَلَاقُ الثَّلَاثِ وَاحِدَةً فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ إِنَّ النَّاسَ قَدْ اسْتَعْجَلُوا فِي أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِمْ فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ/مسلم وغيره/ تەلاق لەسەردەمی پێغەمبەرﷺ و ئەبو بەکرو دووساڵی سەرەتای خەلافەتی عومەردا تەلاقی سێدانە بەیەکەوە بەیەك تەلاق دانراوە جا عومەر وتی: بێگومان خەڵك لەئیشێکدا کەبۆیان هەبو تێیدا لەسەر خۆبن بەراستی پەلەیان تێدا کردخۆزگە ئێمەش بڕیارمان بۆیان بدایە و لە پاشدا ئەو بڕیارەی بەسەریاندا ئەنجام دا}

پێغەمبەریش ﷺ بڕیاری جێنشینەکانی خۆی بە سونەت ناو دەباتو دەفەرموێ: {فَعَلَيْكُمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاءِ الْمَهْدِيِّينَ الرَّاشِدِينَ/ ابوداود، صححه الألباني/ پێویستە لەسەرتان ئەنجامدانی سونەتەکانم

وسونەتی ئەوجێنشینەرێنمای کراووڕێبەرانە} دیارە ئەمە ڕەزایەتی یارەکانیشی لە سەر بوە.

وە لەم ئایەتەدا داواکراوە کە پیاو ئاگاداری عیدەی ئافرەتی تەڵاقی دراوی بێتو بزانێت کەی دەستی پێکردوە بۆ ئەوەی ئەگەر ویستی پێش تەواوبونی بیهێنێتەوە بۆ ژێر نیکاحی خۆیو تا ئافرەتەکەیش ماوەیەکی زیاد چاوەڕێ نەبێت. وەهەروەها پێویست کراوە لەسەر ئافرەتی تەڵاقدراو کە ماوەی عیدەی لە ماڵی مێردەکەی بمێنێتەوە تاکو تەوادەبێتو پیاوەکەیش بۆی نیەدەری بکات یان بارودۆخەکە وا لێ بکات کە ئەو ئافرەتە ناچار بێت ئەو ماڵە بەجێبهێڵێت، بەڵام ئەگەر هاتو خۆی بە بێ ئیزن دەرچو یان داوێن پاك نەبو ئەو کاتە تاوانێك لەسەر پیاوەکە نیە ئەمەش بۆ ئەوەی کە فرسەتێکی تر بدرێت بەڵکو پیاوەکە پەشیمان ببێتەوە.

(٢) ئەوسا هەر کاتێك نزیك بوونەوە لە تەواوکردنی ماوەی خۆیان جا یان بە چاکی ڕایانگرن یان بە چاکیو بە شێوەیەکی پەسەند بە تەواوی تەڵاقیان بدەن، جا دوو پیاوی سەرڕاستی خاوەن داد لە خۆتان بکەن بە شایەتو شایەتیش بۆ خوا بدەن، ئا بەوە ئامۆژگاری کراوە ئەو کەسەی کە باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت، خۆ هەر کەسێکیش لە خوا بترسێت خودا دەروی خێری لێدەکاتەوە، لەراستیدا ئەو ئامۆژگاریە بۆ هەمو مرۆڤێکە بەڵام چونکە هەر باوەڕداران بە خواو بە ڕۆژی دوایی سوود لەم ئامۆژگاریانە وەردەگرن بۆیە وادەفەرموێ سابەڵکو خەڵکانی تریش هەستیان بجوڵێتوخۆیان لەخواوە نزیك بکەنەوە، لەم ئایەتەدا پەروەردگار پیاوی باوەڕدار سەرپشك دەکات لە هەڵبژاردنی یەکێك لەودوو ڕێگاو سێهەمی بۆ نیە یان ئەوەیە کە بەردەوام بێت لەسەر ژیانی هاوسەری خۆی لەگەڵ خێزانی دا بەشێوازێکی جوانو ڕێكوپێك کە ئەمەیانی پێش خستوە یان ئەوەیە کە وازی لێ بهێنێتو تەڵاقی بدات بە چاکیو دوور لە دروستکردنی ئێشو ئازا بۆیو باسکردنی بە خراپەو دەرخستنی عەیبەکانیو دژمنایەتی کردنی، بەڵام ئەوکەسەی کە هیچکام لەم دوو ڕێگایە ناگرێتە بەر ئەوە فەرمانی پەروەدگاری بەجێ نەهێناوە، پێویستە ئەوەش بزانرێت کەبواری ئەحکامەکانی وارەخساندوە کە ژیانی هاوسەری بەوپەری خۆشەویستیو ڕێزەوە بەردەوام دەبێت بەڵام ئەگەر هاتو ژنوپیاو کێشەو ناکۆکیان لە بەینداً بو ئیسلام پێش هەمو شت چەند قۆناغێك دادەنێت بۆ ئەوەی کە ئەو ناکۆکیە لە ناوبباتو ژیانی هاوسەری بپارێزێت کە لە ئامۆژگارییەوە دەست پێدەکات تا ناوبژیوان بۆبن بڕ کردنی ئەوکێشەیە، پێغەمبەرمان ﷺ ئامۆژگاری باوەڕدان دەکاتو دەفەرموێ: {لا يَفْرَكْ مؤمن مؤمنةً، إنْ كَرِهَ منها خُلُقاً رَضِيَ مِنْهَا آخَرَ/ مسلم وغيره/ هیچ پیاوێکی باوەڕدار با ڤینی نەبێت لە ئافرەتێکی باوەڕدار ئەگەر ڕەوشتێکی لاباش نیە خۆ ڕەوشتێکی تری هەیە کەلێی ڕازی بێت}

واتە با ئینساف هەبێتو چاکەکانی خێزانی خۆی لە پێش چاوبێتو ئەو ڕقوقینە نەیگەیەنێت بە تەڵاقو جیابونەوە، بەڵام ئەگەر هاتو هیچ ڕێگایەك بۆ لەناوبردنی کیشەی نێوان ژنوپیاو بێجگە لە تەڵاق نەبو ئەوا تەڵاق ڕێگایەکی ناچارییە کەئیسلام ڕێگای پێداوە تا بەکاربهێنرێت بۆ ئەوەی کە خراپتر ڕونەدات جا بۆیە تەڵاق بە بێ هۆکارێکی شەرعی پەسەند نەکراوەو پێغەمبەرمانﷺ هانی باوەڕداران دەدات کە ئەو ژیانی هاوسەریەبەرێز بگرنو نەیبچڕێننو دەفەرموێ: {إنَّ اللهَ يُوصيكم بالنِّساء خيراً، إن اللهَ يوصيكم بالنساء خيراً؛ فإنهنَّ أمهاتُكم، وبناتُكم وخالاتُكم / الطبراني، صححه الألباني/ بەبێگومان کە اللهُ ﷻئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ ژناندا چاك ڕەفتار بکەن، بەبێگومان کە اللهُ ﷻ ئامۆژگاریتان دەکات کە لەگەڵ ژناندا چاك ڕەفتار بکەن، چونکە بێشك کە ئەوانەدایکتانو کچتانوپورتانن}

جا دەرکەوت کە هەرچۆنێك نیکاح کردارێکی شەرعیە تەڵاقیش هەروەها کردارێکی شەرعیەو ئەحکامی تایبەتی خۆی هەیەو مافی پیاووبۆگاڵتەو گەمە نیەوموسڵمان دەبێ ئاگای لێ بێت بەبێ داخوازییەکی شەرعی بەکاری نەهێنێ پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ثلاثٌ جِدُّهُنَّ جِدٌّ، وهزلُهنَّ جِد: النكاحُ، والطّلاقُ، والرَّجعةُ/ أبو داود، صححه الألباني/ سێ شت هەیە بەراستی بەکاریان بهێنی بەراست دادەنرێن و بەگاڵتەش بەکاریان بهێنیت هەر بەراست دادەنرێن: نیکاحو تەڵاق رجعت} جا ئەوکەسەی کە سەر بەخۆیی بە خێزانی بڵێت: ئەوا تەڵاقم دایت یان وشەیانێکی تر کە بەو ماناو مەبەستە بەکار دێن بەکاربهات تەڵاقی دەکەوێت جا ئەو کەسەی کە لە ژێر ناچارییەکی مادی یان مەعنەویدا بێت ئەگەر ئەو وشەیەی بەسەر زماندا هات ئەوە تەڵاقی ناکەوێت لەبەر ئەم فەرمودانەی پێغەمبەرمان ﷺ لەعوسمانی کوڕی عەفانەوە ﷺ هاتوە کەدەڵێت:{لَيسَ لِمَجنونٍ وَلا سُكرانَ طَلاقٌ/ البخاري/ بۆشێتومەست تەڵاق کەوتن نیە}

یان ئەو کەسەی کە ئەوندە توڕە بوە کە ئاگای لەو وشەیە نیە کە دەیڵێت، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:{لا طَلاقَ ولا عِتاقَ في إغلاقٍ/احمد، صححه الألباني/ نە تەڵاق دەکەوێتو نە ئازاد کردنی بەندە دەبێت لە کاتێکدا کابرا لەو پەڕی توڕەیی یان ناچاری دا بێت.}

بەڵی شێتیو سەرخۆشیو تۆڕەیی لەحەدبەدەر هەموشتانێکن کە ماڵوێرانکەرن جا چونکە ئایینی ئیسلام ئاینی کۆکردنەوەیە نەك جیاکردنەوە ئایینی خۆشەویستیو پاراستنی مافەکانە نەك

دژمنایەتیو پێشێلکردنی مافەکان جا بۆیە دەبینین کە ئیسلام حیسابێك بۆ تەلاقی ئەم جۆرکەسانە ناکات تاکو هەنگاوێکی تر بێت بۆ پاراستنی ژیانی هاوسەریو کەم کردنەوەی زیانەکانی ئەم جۆرەرەفتارانە لەناوکۆمەڵگادا.

وەلەم ئایەتەدا پێویستکرا کە لە سەر تەلاقدانەکە یان گەڕانەوەی ئافرەتەکە دوو شایەتی بۆ دابنێت کە شایەت بن لە سەری، تاکو پیاوەکە نەتوانێت تەلاقەکە بشارێتەوەو ژمارەی تەلاقەکانی دیاربن یان لەپاش ئەوەی کە گەڕاندویەتیەوە بیشارێتەوە وببێت بە هۆی تێکەڵبونی وەچە، ئەگەر لە ماوەی عیدەکەیدا نەیهێناوە ئەوا بەتەواوی لەیەك جیادەکرێنەوەوەك دوو نامەحرەمیان پێدێتو حەرامیش دەبن لەیەکتری مەگەر سەر لە نوێ عەقد بکرێتەوە. جا لە کۆتای ئایەتەکەدا داوا دەکات کە لەخوا بترسنو فەرمانانەکانی بەچاکی جێبەجێ کەن جا ئەگەر واتان کرد ﷲ لەو ناکۆکیو گرفتاریە رزگارتان دەکات.

(٣) جا ڕۆزی پێدەدات لە ڕێگایەکەوە کە خۆی هەستی پێ ناکاتو هەر کەسێك خۆی بەخوا بسپێرێت ئەوسا ئەوزاتە خۆی بەسە بۆی لە هەمو کارەکانیدا، بێگومان کە خودا فەرمانی خۆی دەباتە سەر، بۆ هەمو شتێکیش ماوەی دیاری خۆی هەیە لە لای ئەو خۆ لەو کاتەیش بۆی دیاریکردوە پاشو پێش ناکات،

(٤) ئەو ئافرەتانەی ئێوە کە لە عادەی ژنانە نائومێدن بەهۆی پیریانەوە (ئەگەر کەوتنە گومانەوەلە چۆنیوچەنی عیددەکەیان) ئەوە عیدەیان سێ مانگەو ئەو ئافرەتانەیش کە نەکەوتوونەتە عیددەوە لەبەر منداڵییان (ئەوانیش هەر سێ مانگە)و ئەوانەیش کە سکیان هەیە ماوەکەیان بەدانانی سکەکەیەتیو هەر کەسێکیش لە خودا بترسێت خودا کاروباری بۆ ئاسان دەکات.

عیدەی دیاری کراو بۆ ئافرەت ئەمانەیە:

**یەکەم:** عیدەی ئافرەتێك کە تەلاقەکەی ڕیجعی بێت سێ عادەیە بۆ ئەوانەی کە دەکەنەوە سوڕی مانگانەوەو سێ مانگە بۆ ئەوانەی کە عادەیان نیەو ئەگەر ئافرەتەکەیش سکی هەبو ئەوە عیدەکەی بەدانانی سکەکەیەتی، لەم ئایەتانەدا باس لەمانەکراوە،

**دووهەم:** عیدەی ئافرەتانێك کە تەلاقی سیانە دراونو بە تەواوی جیابونەتەوە،

**سێهەم:** ئافرەتێك کە بە خولع جیابوتەوە یان بەهۆی هەڵشانەوەی عەقدی زەواجەوە جیا بوەتەوە عیدەی ئەمانیش هەروەك ئەوەوایە کەلەم ئایەتانەدا باسکراوە،

**چوارەم:** عیددەی ئافرەتێك کە هێشتا پیاوەکەی بەتەنهایی نەچوەتەلای، واتە پێش ئەوەی کەبەیەکەوە بەتەنهایی کۆببنەوە تەلاقی داوە ئەمە عیدەی لە سەر نییەو پێویست ناکات کە ماوەیەك چاوەڕێی بکات،

أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَآرُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا۟ عَلَيْهِنَّ ۚ وَإِن كُنَّ أُو۟لَٰتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا۟ عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ ۚ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَـَٔاتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ۖ وَأْتَمِرُوا۟ بَيْنَكُم بِمَعْرُوفٍ ۖ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُۥٓ أُخْرَىٰ ﴿٦﴾ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا مَآ ءَاتَىٰهَا ۚ سَيَجْعَلُ ٱللَّهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا ﴿٧﴾ وَكَأَيِّن مِّن قَرْيَةٍ عَتَتْ عَنْ أَمْرِ رَبِّهَا وَرُسُلِهِۦ فَحَاسَبْنَٰهَا حِسَابًا شَدِيدًا وَعَذَّبْنَٰهَا عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨﴾ فَذَاقَتْ وَبَالَ أَمْرِهَا وَكَانَ عَٰقِبَةُ أَمْرِهَا خُسْرًا ﴿٩﴾ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا ۖ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ يَٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۚ قَدْ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكُمْ ذِكْرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْكُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٍ لِّيُخْرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ۚ وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعْمَلْ صَٰلِحًا يُدْخِلْهُ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا ۖ قَدْ أَحْسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزْقًا ﴿١١﴾ ٱللَّهُ ٱلَّذِى خَلَقَ سَبْعَ سَمَٰوَٰتٍ وَمِنَ ٱلْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ يَتَنَزَّلُ ٱلْأَمْرُ بَيْنَهُنَّ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ وَأَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَحَاطَ بِكُلِّ شَىْءٍ عِلْمًۢا ﴿١٢﴾

**پێنجەم:** عیدەی ئافرتێك کە مێردەکەی بمرێت جا پێش یان پاش ئەوەی کە خەڵوەتی لەگەڵدا کرا بێت ئەوە چوارمانگو دە ڕۆژە بەڵام ئەگەر سکی هەبو ئەوە عیدەی بەدانانی سکەکەیەتی.

(٥) ئەوەی کە باسکرا فەرمانی خودابو ڕەوانەی کردوە بۆ ئێوەو هەر کەسێکیش لە خوا بترسێت خراپەکانی لەسەر لادەباتو پاداشتیشی لەسەر چاکەکانی کە کردویەتی گەورە دەکات، دیارە بناغەی بەجێ هێنانی فەرمانەکانی ﷲ دەگەڕێتەوە بۆ تەقواو لەخواترسان ئەگەر تەقوا هەبو پیاو خۆی هەوڵ دەدات کە فەرمانەکانی ﷲ جێبەجێ بکاتو مافی خێزانەکەی بداتو لەکاتی تەڵاقدانیشیدا ئەو مافانەی کە ﷲ دیاری کردوە بۆ ئافرەتەکەی پێی بدات بەڵام ئەگەر تەقوا کەم بویەوەو بێ تەقوایی لە ناو خەڵکدا زۆر بو ئەوکاتە ئەرکی سەرشانی دەسەڵاتە کە ئەو مافانەی ئافرەت بپارێزێتو پیاوەکە مەجبور بکات کە ئەو مافانە جێبەجێ بکات جا لە کۆمەڵگەیەکدا کە نە تەقوای تێدا بێتو نە دەسەڵاتەکە حوکم بە قورئان بکات واتە قورئان هێزی لە گەڵدا نەبێت ئەوکاتە باس لەم مافانە نامێنێتو ئافرەتیش زۆرترین زوڵمی لێدەکرێت جا هەمو ئەوەی کە خۆی بە باوەڕدار دەزانێت ئیمانەکەی لە لێواری لەناوچونداىە تا ئەو کاتەی ئەوەی پێی دەکرێت بیکات بۆ ئەوەی کە حوکمەکانی شەریعەت کە فەرمانی پەروەردگارە بەکردار جێ بەجێ بکرێن، بەراستی جوانی فەرموە عوسمانی کوڕی عەففان کە دەفەرموێ: {إنَّ اللهَ لَيَزَعُ بِالسُّلطَانِ مَا لا

يَرَع بِالقرآنِ/ ابن كثير/ بەبێگومان خوا بە هێز شتانێك لادەبات كە بەقورئان لای نابات}. ئینجا دەفەرموێ:

(٦) لەكوێدا خۆتان نیشتەجێن جێگای ئەو ئافرەتە تەلاقدراوانەش بكەنەوە تا عیدەیان تەواو دەبێت بەگوێرەی دەست ڕۆیشتنتانو زیانیان لێمەدەن بۆ ئەوەی ژیانیان لێ تەنگ بكەنو ناچاربن كەئەو جێگایە چۆڵ بكەن.

واتە ئافرەت لە عیدەی تەلاقدا دەبێت جێگای بۆ دابین بكرێت لەلایەن تەلاقدەرەوەو ئەگەر سكی هەبو دەبێت تا دانانی سككەیشی خەرجی بدرێت جا ئەگەر شیری دا بە منداڵەكەتان ئەوسا دەبێت كرێی شیردانەكەیشی پێبدەن لەناو خۆتاندا بە شێوەیەكی چاكو بە گوێرەی باوی خۆتان ڕێك بكەون جائەگەر بەو خەرجیە بارتان گران دەبو بە شێوەیەك كە توانای هەڵگرتنیتان نەبو با ئافرەتێكی تر شیری پێبدات بۆتان. واتە ئافرەتێك كە بەریجعی تەلاق دراوەو پیاوەكەی دەتوانێت بیگەڕێنێتەوە پێویستە نەفەقەی بداتو لەلای خۆیدا نیشتەجێی بكات چ سكی هەبێت یان نە بەڵام ئەگەر تەلاقی سیانە بو ئەوە پێویست ناكرێت لەسەر پیاو، مەگەر ئەوەی كە ئافرەتەكە سكی هەبو كە ئەم ئایەتە بە جیا باسی لێوەكرد، فاتیمەی كچی قەیس دەڵێ: {أَنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاثًا، فَلَمْ يَجْعلْ لَهَا النَّبِيُّ ﷺ نَفَقَةً وَلاَ سُكْنَىَ/ابوداود،صححه الألباني/ مێردەكەی هەرسێ تەلاقەی دا جاپێغەمبەر ﷺ خەرجیو جێگای بۆدانەنا}

هەندێكیش وتویانە ئەم فەرمودەیە ئەوە دەگەیەنێت كە ئەوفەرمانە لەو ئایەتەدا بۆ پێویست(وجوب) نیە، هەرچەند پیاوانی بەرزوبەرێز ڕەخنەیان لەقسەی ئەوئافرەتەگرتوە بەڵام من وای بەچاك دەزانم چونكە بەوشێوەیە تەوافق دروست دەبێتو كار بە هەر دوولا دەكرێتو هیچكام لەدوو دەقە پشتگوێ ناخرێنوقسەی كۆمەڵێكیش لەزانایانە. والله اعلم.

(٧) ئەو كەسەی كە وەزعی ئابوری چاكە با لەو ماڵەی خۆی ببەخشێتو خەرجی ئافرەتە تەلاقدراو و سكدراو شیردەرەكەی بداتو منداڵەكەی نەخاتە تەنگانەوە بەهۆی خۆگرتنەوە لە خەرجیكردنی بۆی، ئەوسا هەر كەسێكیش كەمدەست بو بەگوێرەی كەمدەستی خۆی خەرجی بدات، خودا داوا لە كەس ناكات مەگەر بەو ئەندازەی كە خودا پێیداوە (با دڵنیاش بن كە بەم زوانە پاش كەمدەستیو تەنگانە خودا دەسەڵاتو فرەوانی دەداتو لەو تەنگانەیە ڕزگاری دەبێت. بزانن كە ئەمانە هەمو فەرمانی پەروەرد

گارتانە جا لە الله بترسنو نا فەرمانی نەكەن چونكە ئەگەر ئەوەتانكرد سزای پەروەردگار چاوەڕوانیتان دەكات،

(٨) جا زۆر خەڵكانی شارانی تر هەبون كە سەرپێچیان كردوە لە فەرمانی پەروەردگاری خۆیانو پێغەمبەرەكانی ئەوسا ئێمەش بەتوندی چەندو چونیمان لەگەڵدا كردون سزامان داون بە سزایەكی دژوارو بێزراو.

(٩) جا سزای خراپی كارەكانیان چەشتو سەرئەنجامی كاری ئەوان ڕەنجەڕۆی بوە.

(١٠) خودا سزای توندی داناوە بۆیان جا لە خوا بترسن ئەی خاوەن عەقڵانێكی باوەڕدار با دوچاری ئەو سزا ئامادە كراوە نەبن، بە حەقیقەت خودا شەرەفو بەرزی ناردوە بۆتان.

(١١) كەپێغەمبەرێكە نیشانە ڕۆشنكەرەوەكانی خواتان بۆ دەخوێنێتەوە تا ئەوانەی كە باوەڕیان هێناوەو كرداری چاكیان كردوە تا لە تاریكی سەرلێشێواوی دەریان بهێنێتو بیانخاتەناو ڕووناكیەوە كە پەیڕەویكردنی ڕێبازی ئیسلامەو هەر كەسێك باوەڕ بە خوا بكاتو كرداری چاك ئەنجام بدات خوا دەیخاتە ناو باخچەگەلێكەوە كە بەناویدا چەندین جۆگە دەڕوات (كە لە ئاوی چاكو هەنگوینی سافو شیری خاوێنو شەرابە)و بۆ هەمیشە تێیدا دەمێننەوە، بە حەقیقەت خودا ڕۆزیو بژێوی جوانی پێدەدات،

(١٢) خودا ئەو زاتەیە كە حەوت ئاسمانی دروستكردوەو لەزەویشدا هەروەكو ئەوانە واتە حەوت زەوییە كە فەرمانی خودا دادەبەزێنێتە نێوانیان، هەموی لە ژێر فەرمانی ئەودانو ئەحكامە شەرعیەكانیش بۆ بەندەكانی خۆی ڕەوانە دەكات تا بزانن كە خوا توانای بەسەر هەمو شتێكدا هەیەو بە بێشك زانیاری خودا هەمو لایەكی گرتوەتەوەو هەموی لە گەمارۆی زانیاری خودادایە.

جا ئەو فەرمانانەی كە دەیكاتو ئەو بڕیارانەی كە دای دەنێت بۆ بەندەكانی لەسەر بناغەی عیلمو حیكمەتەو لادان لێی سەر لێشێواویو گومراهیە﴿ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ ﴾ یونس: ٣٢/ساپاش ڕاستی چی هەیە بێجگە لە گومراهی؟جا چۆن لەوڕاستیە لادەدرێن؟!

بەراستی ئەم باسی نیكاحو تەلاقە لەپەڕاوەفیقهیەكاندا زۆربەدرێژی باسكراوە جا ئەگەر زانیاری زیاترت دەوێ چاوێك بەواندا بخشێنە بەسودە.

## سورەتی تەحریم ٦٦ - ١٢

سورەتی تەحریم کە سورەتی شەستو شەشەمی قورئانە، بە سورەتی ﴿ ٱلنَّبِيُّ ﴾یش ناو دەبرێت کە بەکۆی دەنگ لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، دوانزە ئایەتە، ناسخو مەنسوخی تێدانیە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سەدوپێنجەمین سورەتەو لە پاش سورەتی( الحجرات )و پێش سورەتی( الجمعة ) دابەزیوە.

ئەم سورەتەش هەروەك سورەتی پێشو رو لە پێغەمبەر دەكاتو باس لە ناكۆكیەكانی ژیانی هاوسەری دەكات، بەڵام بە هۆی بەرزی پلەو پایەی پێغەمبەرو خێزانەكانی ئەم سورەتە تایبەت بەوان كراوە، هەر بۆیە لە كۆتایی سورەتەكەشدا باس لەو دوو ئافرەتە بەرێزە بەهەشتیە دەكات كە ئاسیەو مەریەمی كچی عیمرانە، وە بە جیا كردنەوەی تێمان دەگەیەنێت كە (التَّحْريم ) حوكمی تەڵاقی نیە، بەڵكو ئەوە سوێندە، بۆ هۆی دابەزینی ئەم سورەتە دوو شت وتراوە كە جێگای باوەڕن یەكێكیان ئەوەبو: كە پێغەمبەر ﷺ ماریەی قیبطی لەخۆی حەرام كردو ئەم قسەیەی لەلای خاتون حەفسەی خێزانی كرد، حەفسە وتی: تۆ شتێك خوا حەڵاڵی كردوە بۆت، حەرامی دەكەیت لە خۆت، سوێندی خوارد نەچێتە لای، تا حەفسە ئەم قسەیەی لەلای عائیشە باسكرد، جا خوا ئەم سورەتەی نارد.

دووهەمیان: دەڵێن پێغەمبەر ﷺ كە دەچوە لای زەینەبو دەمایەوە لەلای، عائیشە دەڵێت منو حەفسە قسەمان كرد بەیەك كە ئەگەر پێغەمبەر ﷺ هاتە لای هەر كاممان بڵێن: تۆ بۆنی (مەغافیر- كە بۆنێكی خۆش نیە) لێت دێت، دەڵێی مەغافیرت خواردوە، جا هاتە لای یەكێكمان ئەوسا ئەو قسەیەی پێ وت، فەرموی: ( قەیناكە لەلای زەینەبی كچی جەحش هەنگوینم خواردوە ئیتر نایخۆم) جا ئەم سورەتە دابەزی .

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی پێغەمبەر ﷺ بۆچی بۆ ڕاگیركردنی دڵی خێزانەكانت ئەو شتەی كە خوا بۆی ڕەواكردوی لە خۆتی قەدەغە دەكەیت؟ شتی وا نەكەیتو خوا چاوپۆشی لە تاوانی بەندەكانی دەكاتوبێنیهایەت میهرەبانە بۆیان. مەبەست لە تەحریم ئەوەیە كە پیاو بەخێزانی بڵێت: ئەوە تۆ لە من حرام بیت، جا ئەم وتەیە بەم مانایە بە تەڵاق هەژمار ناكرێت،

ئیبنو عەباس دەڵێت:{إذا حرَّم الرجلُ عليه امرأتَهُ فهي يمينٌ يُكفِّرها، /مسلم وغيره/ هەركاتێ پیاوێك ژنەكەی لە خۆی قەدەغە كرد، ئەوسا ئەوە سوێندەو دەبێ كەفارەتی بدات} .

سُورَةُ التَّحْرِيمِ ٦٦ - ١٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١﴾ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ﴿٢﴾ وَإِذۡ أَسَرَّ ٱلنَّبِيُّ إِلَىٰ بَعۡضِ أَزۡوَٰجِهِۦ حَدِيثٗا فَلَمَّا نَبَّأَتۡ بِهِۦ وَأَظۡهَرَهُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ عَرَّفَ بَعۡضَهُۥ وَأَعۡرَضَ عَنۢ بَعۡضٖۖ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِۦ قَالَتۡ مَنۡ أَنۢبَأَكَ هَٰذَاۖ قَالَ نَبَّأَنِيَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡخَبِيرُ ﴿٣﴾ إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدۡ صَغَتۡ قُلُوبُكُمَاۖ وَإِن تَظَٰهَرَا عَلَيۡهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ هُوَ مَوۡلَىٰهُ وَجِبۡرِيلُ وَصَٰلِحُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ ظَهِيرٌ ﴿٤﴾ عَسَىٰ رَبُّهُۥٓ إِن طَلَّقَكُنَّ أَن يُبۡدِلَهُۥٓ أَزۡوَٰجًا خَيۡرٗا مِّنكُنَّ مُسۡلِمَٰتٖ مُّؤۡمِنَٰتٖ قَٰنِتَٰتٖ تَٰٓئِبَٰتٍ عَٰبِدَٰتٖ سَٰٓئِحَٰتٖ ثَيِّبَٰتٖ وَأَبۡكَارٗا ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَعۡتَذِرُواْ ٱلۡيَوۡمَۖ إِنَّمَا تُجۡزَوۡنَ مَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٧﴾

(٢) بە حەقیقەت خوا هەڵوەشاندنەوەی سوێندەكانی لەسەرتان حەڵاڵ كردو خوا گەورەو دۆستی ئێوەیەو هەر خۆیەتی زانایە بەوەی، كەچی خەیری ئێوەی تێدایەو كاربەجێ یەو ئەوەی كە ئەو بۆی داناون سودی ئێوەی تێدایە، مەبەست ئەو كەفارەتی سویندەیە كە لە سورەتی ( المائدە)دا باسكراوە، بەڵێ پەروەردگار ئەو حوكمانەی كە دایدەنێت بەگوێرەی عیلم و حیكمەتە. وتراوە: (الحِْكْمَة: إعطاءُ الأفعالِ ما تَقْتَضِيه حقائقُها دُونَ الأوهامِ والتخيُّلات:حیكمەت: بەخشینی ڕوە ڕاستیەكانە بەكردارەكان نەك دالغەو خەیاڵ پلاوەكان).

(٣) جا لە كاتێكدا كە پێغەمبەر ﷺ قسەیەكی بە نهێنی لەگەڵ هەندێك لە هاوسەرانیدا كرد، ئەویش ئەو هەواڵەی بە جگە لە خۆی گەیاند، ئەوساخواش پێغەمبەر ﷺ ی ئاگادار كردەوە لەسەر ئەوە، جا پێغەمبەریش ﷺ هەندێكی بۆ باسكردو هەندێكی نەوت، ئیتر كاتێك كە ئەمەی بەو خێزانەی وت خێزانەكەی وتی: كێ ئەمەی بەتۆ وتوە؟ فەرموی: زانای زۆر بەئاگا كە (اللّٰه)یە بەمنی وتوە.

(٤) ئەگەر پەشیمان ببنەوە لەو هەڵوێستەی خۆتان ئەمە چاكە بۆتان بەحەقیقەت دڵتان لایداوە لە شتی چاك كە شتێكتان پێخۆشە كە ئەو پێی خۆش نیە، كەواتە وازهێنان لە كەنیزەكەی یان لە هەنگوین كە پێغەمبەر ﷺ هەردووكیانی پێخۆشبو، جا

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا تُوبُوا إِلَى اللَّهِ تَوْبَةً نَصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَنْ يُكَفِّرَ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ يَوْمَ لَا يُخْزِي اللَّهُ النَّبِيَّ وَالَّذِينَ آمَنُوا مَعَهُ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَانِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَا أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَاغْفِرْ لَنَا ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٨﴾ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ جَاهِدِ الْكُفَّارَ وَالْمُنَافِقِينَ وَاغْلُظْ عَلَيْهِمْ ۚ وَمَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ ۖ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ ﴿٩﴾ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ كَفَرُوا امْرَأَتَ نُوحٍ وَامْرَأَتَ لُوطٍ ۖ كَانَتَا تَحْتَ عَبْدَيْنِ مِنْ عِبَادِنَا صَالِحَيْنِ فَخَانَتَاهُمَا فَلَمْ يُغْنِيَا عَنْهُمَا مِنَ اللَّهِ شَيْئًا وَقِيلَ ادْخُلَا النَّارَ مَعَ الدَّاخِلِينَ ﴿١٠﴾ وَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا لِلَّذِينَ آمَنُوا امْرَأَتَ فِرْعَوْنَ إِذْ قَالَتْ رَبِّ ابْنِ لِي عِنْدَكَ بَيْتًا فِي الْجَنَّةِ وَنَجِّنِي مِنْ فِرْعَوْنَ وَعَمَلِهِ وَنَجِّنِي مِنَ الْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿١١﴾ وَمَرْيَمَ ابْنَتَ عِمْرَانَ الَّتِي أَحْصَنَتْ فَرْجَهَا فَنَفَخْنَا فِيهِ مِنْ رُوحِنَا وَصَدَّقَتْ بِكَلِمَاتِ رَبِّهَا وَكُتُبِهِ وَكَانَتْ مِنَ الْقَانِتِينَ ﴿١٢﴾

ئەگەر هەردووكتان (عائيشەو حەفصە) پشتى يەك بگرن لە دژى ئارەزۆى پێغەمبەر ﷺ، ئەوسا بێگومان كە خوا خۆى لايەنگريەو جوبرەئيلو پياوچاكانى باوەڕدارو تەواوى فريشتەكانيش پاش ئەوە (ئەگەر پەشيمان نەبنەوە) پشتيوانيەتى، بوخارى هێناويەتى كە عومەر دەڵێت: ژنانى پێغەمبەر ﷺ يەكيان گرت لە تەنگهەڵچنين بە پێغەمبەر ﷺ بۆ بابەتى خەرجيان منيش وتم (نزيكە پەروەردگارى ئێوە ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات هاوسەرانێكى چاكتر لە ئێوەى پێبدات موسڵمان بن باوەڕدار بن بەندايەتيكەر بنو...و..هتد) جا خوا هەمان قسەى دابەزاند بۆ پێغەمبەر ﷺ واتە: قسەكانى عومەر ڕێك بو لەگەڵ ئەوەى كە خوا لە ئەزەلدا تۆمارى كردبو كە دەفەرموێ:

(٥) نزيكە پەروەردگارى (ئەگەر ئێوە تەڵاق بدات) بۆى بگۆڕێت بە هاوسەرانێكى چاكتر لەئێوە كەموسڵمان، باوەڕدار، گوێڕايەڵ، لە خراپە پەشيمان، بەندايەتيكەر، ڕۆژووگر، بێوەژنو كچيان تێدابێت.

(٦) ئەى ئەوانەى كە باوەڕتان هێناوە خۆتانو خاوخێزانتان لە ئاگرێك بپارێزن كە هەڵگيرسێنەرى خەڵكو بەردە، فريشتە گەلێكى دڵڕەقو بەهێز سەرپەرشتى دەكات كە هەرگيز ئەوانە لە فەرمانى خودا لانادەنو هەر چييان پێ بوترێت ئەنجامى دەدەن. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{مُرُوا أبناءَكُم بالصَّلاةِ لِسَبعٍ وَاضرِبُوهُم عَلَيها لِعَشرٍ وَفَرِّقُوا بَينَهُم فِي المَضَاجِعِ/ ابوداود، الالباني:حسن صحيح/ بە منداڵى حەوت ساڵيتان نوێژ بكەنو لە دە ساڵيدا لەسەر نوێژ نەكردن لێيان بدەنو براو خوشك لەم تەمەنەدا لە يەك جيابكەنەوە لەكاتى خەوتندا} هەمو كەسێك لێپرسراوە سەبارەت بە خوارى خۆى، جا پێويستە بە چاكى ئامۆژگارى بكاتو لە ئاگرى دۆزەخ دوريان بخاتەوە.

(٧) ئەى ئەو كەسانەى كە خوانەناسن ئەمڕۆ كە قيامەتە هيچ بەهانەيەك مەگرن، چونكە چۆنتان ئيشكردوە هەر ئاوەهاش تۆڵەتان لێدەسەنرێتو ستەم لە كەس ناكرێت،وتراوە "چى بچێنيت هەر ئەوە دروێنە دەكەيت".

(٨) ئەى ئەوانەى كە باوەڕتان هێناوە بگەڕێنەوە بۆ لاى خودا بە گەڕانەوەيەكى ڕاستو دروستو تەوبەيەكى ڕاست بكەن، نزيكە پەروەردگارتان تاوانەكانتان داپۆشێتو بتانخاتە ناو باخچەيانێكەوە كە چەندين جۆگاى بەناودا دەڕوات، ئەو ڕۆژەى كە خوا پێغەمبەر ﷺ و ئەو باوەڕدارانەى كە لەگەڵيدان شەرمەندەو ڕسوايان ناكات، ڕووناكيەكەيان لەپێش دەميانو بە لاى ڕاستياندا دەڕواتو دەڵێن: ئەى پەروەردگارمان ئەم ڕووناكيەمان بۆ تەواوبكە تا دەگەينە جێگاى مەبەستو لێمان ببورە، بێگومان كە تۆ توانات بەسەر هەمو شتێكدا هەيە. زانايان وتويانە تەوبەى نەصوح ئەو تەوبەو گەڕانەوەيە كە چوار مەرجى تێدا بێت: دەبێ دڵى پڕ بێت لە ڕقو بێزارى بەرامبەر بەو تاوانە، جەستەو ئاندامەكانى لێدوربخاتەوە، دۆستانو برادەرانى خراپى تەرك بكات پاشان دەست بەرزبكاتەوەو بە زمان داواى لێخۆشبون بكات لە پەروەردگارى، چونكە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ رَبَّكُم تَبَارَكَ وَتَعَالَى حَيِيٌّ كَرِيمٌ يَسْتَحْيِي مِن عَبدِهِ إِذَا رَفَعَ يَدَيْهِ إِلَيْهِ أَنْ يَرُدَّهُمَا صِفْرًا /ابوداود، صححه الألباني/ بێگومان كە پەروەردگارتان بەشەرموسەخييەكى وايە كە شەرم دەكات لەوەى كە هەركاتێك بەندەيەكى هەردوو دەستى بەرزبكاتەوە بۆ لاى، ئەو بەخاڵى بيانگەڕێنێتەوە} بەڵام ديارە ئەم مەرجانە لە ئەهلى بيدعە نايەنەدى، چونكە بيدعەچى لێى پەشيمان نيە بەڵكو بەچاكەو خەيرى دەزانێت، جا بۆيە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ اللهَ حَجَبَ التَّوبَةَ عَن كُلِّ صَاحِبِ بِدْعَةٍ حَتَى يَدَعَ بِدْعَتَهُ/ الطبراني، صححه الألباني/ بێگومان كە اللَّهُ بەرگرى تەوبەى كردوە لە هەمو بيدعەچييەك هەتا واز لەو بيدعەيە دێنێت}.

(٩) ئەى پێغەمبەر ﷺ دژى خوانەناسانو دووڕووەكان بجەنگە، (لەگەڵ خواناساندا بە شمشێرو لەگەڵ دووڕواندا بە زمانو لێدانى حەد لەسەر ئەو تاوانانەى كە دەيكەنو ئاشكرا دەبێت)و دڵڕەق بە سەبارەت بەوان، ئەوسا جێگايان دۆزەخەو خراپترين جارەنوسيانە ئەو دۆزەخە.

(١٠) خوا ژنی نوحو ژنی لووت بۆ ئەوانەی کە خوانەناسن بە نمونە باسدەکات کە هەردووکیان خێزانی دوو بەندە بون لە بەندەچاکەکانی ئێمە، ئەوسا خیانەتیان کرد هەر یەکەیان بەدژی مێردی خۆی دەجولایەوە، جا ئەوانیش هیچ سودێکیان بەو دوو ژنەی خۆیان نەداوەو هەر کە مردن پێیان وترا لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە دەچنە ناو ئاگرەوە ئێوەش بچنە ناویەوە. وتراوە خیانەتی خێزانی نوح ئەوە بوە کە باوەڕی پێ نەهێناوەو بەخەڵکی دەوت کە پیاوەکەم شێت بوە، خیانەتی خێزانی لووتیش ئەوە بو کەسەرەرای ئەوەی کە باوەڕ پێ نەهێنا هەواڵی مێوانەکانی لووتیشی بە بێباوەڕان راگەیاندو ئەوانیش پەلاماری ماڵی لووتیان داو زەحمەتێکی زۆریان بۆ دروستکرد تا وای لێ هات کە ﴿وتی: خۆزگە زۆرم بەئێوە بشکایە﴾هود/٨٠.

(١١)وە خوا ژنی فیرعەون کە ناوی ئاسیە بو بۆ باوەڕداران بە نمونە باسدەکات ئەو کاتەی کە وتی: ئەی پەروەردگارم لەلای خۆت ماڵێکم بۆ چاك بکەو لە فیرعەونو کردەوە ناپەسەندەکانی ڕزگارم بکەو لە گەلی ستەمکار ڕزگارم بکە، لەم دوو نمونەوە چاك ئاشکرا دەبێت کە پیاو و ئافرەت هەر یەکەیان بۆخۆیان سەربەخۆنو باری کەسیان بەسەرئەویتریاندا نادرێت، راڤەکاران دەڵێن: کاتێك کەموسا بە سەر ساحیراندا سەرکەوت ئاسیەی خێزانی فیرعەون باوەڕی هێنا، جا فیرعەون کە لەمە ئاگادار بویەوە دەستی کرد بە سزا دانی ئاسیە کە ئەویش لە ژیر ئێش و ئازاری ئەو سزایانەدا ئەم دوعایەی کرد کەقورئان تۆماری کردوە، جاهەتا قورئان هەیە دەمێنێ و هەر بەوتنەوەی قسەکەی موسڵمانان خێریان دەست دەکەوێت.

(١٢) جا نمونەیەکی تری باوەڕداران مەریەمی کچی عیمرانە کە دامێنی خۆی لە کاری خراپ پاراست، جا ئێمە لەو ڕۆحەی خۆمان کردبە ناو باخەڵێداو باوەڕی بە وشەکانی پەروەردگاریو پەڕاوەکانی کردو لەو کەسانە بو کە گوێڕایەڵو فەرمانبەرداری خودان.

لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی:{كَمُلَ مِنَ الرِّجَالِ كَثِير، وَلَمْ يَكمُل مِنَ النِّساءِ إلا آسِيَةُ امرَأةُ فِرعَونَ وَمَريَمُ بِنتُ عِمرَانَ، وَخَدِيجَةُ بِنتُ خُوَيلِد، وَإنَّ فَضلَ عَائِشَةَ عَلَى النِّساءِ كَفَضلِ الثَّرِيدِ عَلَى سَايِرِ الطَّعَامِ/ متفق عليه/ زۆر کەس لە پیاوان پیاوی تەواوبوە، بەڵام لە ژنان جگە لەمانە کەسیان تەواو نەبوە، ئاسیەی ژنی فیرعەونو مەریەمی کچی عیمرانو خەدیجەی کچی خوەیلیدو بێگومان ڕێزی عائیشە لەناو ژناندا وەکو ڕێزی تریتی گۆشتاوە بەسەر هەمو خواردنەکانی تردا} .

٦٧ سُورَةُ المُلْكِ ٣٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ (١) ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ (٢) ٱلَّذِي خَلَقَ سَبۡعَ سَمَٰوَٰتٖ طِبَاقٗاۖ مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖۖ فَٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ هَلۡ تَرَىٰ مِن فُطُورٖ (٣) ثُمَّ ٱرۡجِعِ ٱلۡبَصَرَ كَرَّتَيۡنِ يَنقَلِبۡ إِلَيۡكَ ٱلۡبَصَرُ خَاسِئٗا وَهُوَ حَسِيرٞ (٤) وَلَقَدۡ زَيَّنَّا ٱلسَّمَآءَ ٱلدُّنۡيَا بِمَصَٰبِيحَ وَجَعَلۡنَٰهَا رُجُومٗا لِّلشَّيَٰطِينِۖ وَأَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابَ ٱلسَّعِيرِ (٥) وَلِلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَۖ وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ (٦) إِذَآ أُلۡقُواْ فِيهَا سَمِعُواْ لَهَا شَهِيقٗا وَهِيَ تَفُورُ (٧) تَكَادُ تَمَيَّزُ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۖ كُلَّمَآ أُلۡقِيَ فِيهَا فَوۡجٞ سَأَلَهُمۡ خَزَنَتُهَآ أَلَمۡ يَأۡتِكُمۡ نَذِيرٞ (٨) قَالُواْ بَلَىٰ قَدۡ جَآءَنَا نَذِيرٞ فَكَذَّبۡنَا وَقُلۡنَا مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ مِن شَيۡءٍ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا فِي ضَلَٰلٖ كَبِيرٖ (٩) وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ (١٠) فَٱعۡتَرَفُواْ بِذَنۢبِهِمۡ فَسُحۡقٗا لِّأَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ (١١) إِنَّ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُم بِٱلۡغَيۡبِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٞ كَبِيرٞ (١٢)

## ٦٧ سورەتی مولك ٣٠

سورەتی مولك کە سورەتی شەستو حەوتەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، سی ئایەتە، وتراوە حەفتاو شەشەمین سورەتە بە گوێرەی دابەزینو پاش سورەتی (المؤمنون) و پێش سورەتی ( الحاقة ) دابەزیوە.

بە (المُنجِيَة) و (تَبَارَكَ الْمُلْكُ)و (الوَاقِيَةُ/و (الْمَانِعَةُ/ کە ڕزگارکەرو پارێزەرە لە سزای گۆڕ) ناو براوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنَّ سُورَةً مِن كِتَابِ اللهِ مَاهِيَ إلّا ثلاثُونَ ايَةً شَفَّعَت لِرَجُلٍ حَتَّى أخرَجَتهُ مِنَ النَّارِ يَومِ القِيَامَةِ وَأدخَلَتهُ الجَنَّةَ وَهِيَ سُورَةُ تَبَارك/ الحاكم، حسنه الألباني/ بێگومان لە پەڕاوەکەی خوادا سورەتێك هەیە کە هەر سی ئایەتە کە لە ڕۆژی قیامەتدا تکا دەکات بۆ مرۆڤ، هەتا لە ئاگری دەردەهێنێتو دەیخاتە ناو بەهەشتەوە ئەویش سورەتی "تەبارەکە"یە}

ئیبنو مەسعود دەڵێت: {مَنْ قَرأَ تَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ كُلَّ لَيْلَةٍ مَنَعَهُ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ بِهَا مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَكُنَّا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ نُسَمِّيهَا المَانِعَةَ وَإنَّهَا فِي كِتَابِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ سُورَةٌ مَنْ قَرأَ بِهَا فِي لَيلَةٍ فَقَدْ أكْثَرَ وَأطَابَ/النسائي، حسنه الألباني/ هەرکەسێك هەموشەوێك تەبارەکەی مولك بخوێنێت، خوای دەسەڵاتدارو گەورە بەرگری دەکات لەسزای گۆڕ، وە لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺبەمانیعە ناومان دەبرد و بێگومان لەپەڕاوەکەی خوای دەسەڵاتداروگەورەدا سورەتێك هەیە

وَأَسِرُّوا۟ قَوْلَكُمْ أَوِ ٱجْهَرُوا۟ بِهِۦٓ ۖ إِنَّهُۥ عَلِيمٌۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿١٣﴾ أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ هُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ ذَلُولًا فَٱمْشُوا۟ فِى مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا۟ مِن رِّزْقِهِۦ ۖ وَإِلَيْهِ ٱلنُّشُورُ ﴿١٥﴾ ءَأَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا هِىَ تَمُورُ ﴿١٦﴾ أَمْ أَمِنتُم مَّن فِى ٱلسَّمَآءِ أَن يُرْسِلَ عَلَيْكُمْ حَاصِبًا ۖ فَسَتَعْلَمُونَ كَيْفَ نَذِيرِ ﴿١٧﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَكَيْفَ كَانَ نَكِيرِ ﴿١٨﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ فَوْقَهُمْ صَٰٓفَّٰتٍ وَيَقْبِضْنَ ۚ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱلرَّحْمَٰنُ ۚ إِنَّهُۥ بِكُلِّ شَىْءٍۭ بَصِيرٌ ﴿١٩﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى هُوَ جُندٌ لَّكُمْ يَنصُرُكُم مِّن دُونِ ٱلرَّحْمَٰنِ ۚ إِنِ ٱلْكَٰفِرُونَ إِلَّا فِى غُرُورٍ ﴿٢٠﴾ أَمَّنْ هَٰذَا ٱلَّذِى يَرْزُقُكُمْ إِنْ أَمْسَكَ رِزْقَهُۥ ۚ بَل لَّجُّوا۟ فِى عُتُوٍّ وَنُفُورٍ ﴿٢١﴾ أَفَمَن يَمْشِى مُكِبًّا عَلَىٰ وَجْهِهِۦٓ أَهْدَىٰٓ أَمَّن يَمْشِى سَوِيًّا عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٢٢﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنشَأَكُمْ وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۖ قَلِيلًا مَّا تَشْكُرُونَ ﴿٢٣﴾ قُلْ هُوَ ٱلَّذِى ذَرَأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ وَإِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هَٰذَا ٱلْوَعْدُ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٥﴾ قُلْ إِنَّمَا ٱلْعِلْمُ عِندَ ٱللَّهِ وَإِنَّمَآ أَنَا۠ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٦﴾

هەر كەسێ لە هەر شەوێكدا بیخوێنێ بەحەقیقەت چاكەی زۆرترو پاكتری كردوە}

جابیر دەڵێت: {كَانَ لَا يَنَامُ حَتَّى يَقْرَأَ الم تَنْزِيلُ وَتَبَارَكَ الَّذِي بِيَدِهِ الْمُلْكُ / الترمذي، صححه الألباني/ نەدەخەوت هەتا ئەلیف،لام، میمی تەنزیل و تەبارەكەی مولكی دەخوێند}

بەناوی اللَّه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ بە فەڕو بەرەكەتەو چاكەی هەمولایەكی گرتوەتەوە و نەسەرەتای هەیەو نەكۆتاییوەك ئەو زاتەی كە خاوەنیەتی، وە ئەو بونەوەرە تایبەتی ئەوەو بەسەر هەمو شتێكدا توانای هەیە، جا چۆنی بییەوێت ئاوا دەكات، هەندێك بەرز دەكاتەوەو هەندێك دەشكێنێتو هەندێك دەوڵەمەند دەكاتو هەندێكیش هەژار.

﴿٢﴾ ئەو زاتەی كە مردنو ژیانی دروستكردوە، تا تاقیتان بكاتەوە تا هەر كەس بۆ خۆی دەركەوێت كە كامتان ئیشی جوانتر دەكەن، وەهەر خۆیەتی دەسەڵاتدارو لێبوردە. وتراوە مەبەست لە ﴿ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ ﴾ دنیاو دوارۆژە واتە دنیامان بۆ مردنو دوارۆژمان بۆ ژیانی ئێوە دروستكردوە. وەمەبەست لە كرداری جوانتر ئەوەیە كەئەم دوو مەرجەی تێدابێت:

**یەكەم** ـ ئەو كردارە بەوشێوەیە بێت كە شەرع فەرمانی پێداوە.

**دووهەم** ـ مەبەست هەر اللَّه بێتو بە نیەتێكی پاكو خاوێنەوە بكرێت، ئەگەر مەرجی یەكەمی تێدانەبو ئەوە بیدعەیەو تاوانە با نیەتەكەیشی پاك بێت، بەڵام ئەگەر مەرجی دووهەمی تێدا نەبو ئەوە ریاكاریە. بۆ نمونە: شەرع بە رێكو پێك خوێندنی نوێژ فەرمان دەدات، بەڵام ئەگەر نیەتەكە چاك نەبو ئەوە ئەو كردارە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ، بە هاوبەشدانانێكی شاراوە ناو براوە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{أَلَا أُخْبِرُكُمْ بِمَا هُوَ أَخْوَفُ عَلَيْكُمْ عِنْدِي مِنْ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ قَالَ قُلْنَا بَلَى فَقَالَ الشِّرْكُ الْخَفِيُّ أَنْ يَقُومَ الرَّجُلُ يُصَلِّي فَيُزَيِّنُ صَلَاتَهُ لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ رَجُلٍ/ابن ماجه، حسنه الألباني/ ئایا پێتان بڵێم كامەیە لەلای من لە دەجال مەترسی دارترە بۆتان؟ دەڵێ وتمان: بەڵێ. جا فەرموی: هاوبەشدانانی شاراوەیە وەك ئەوەی كەپیاو هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی نوێژ جا كەبینی لە بەرچاوی پیاوێكدایە نوێژەكەی جوان دەكات}

﴿٣﴾ ئەو زاتەی كە حەوت ئاسمانی چین لەسەر چین دروستكردوەو لە دروستكراوەكانی ئەو زاتە بەسۆزەدا نابینی هیچ نارێكیەك هەبێت، جا هەم چاوت بگەڕێنەرەو پێیدا ئایا هیچ لەتبوونێكی پێوە دەبینی؟

﴿٤﴾ پاشان چەندین جار چاوت بگەڕێنەوە پێیدا، جا چونكە هیچ نارێكی و لەت بونێك نابینێت چاوت بە داماویەوە دەگەڕێتەوە بۆ لات، كە هەناسە ساردو پەك كەوتوە لەوگەشتو گەڕانە بێسودەیدا .

﴿٥﴾ جا بەحەقیقەت ئاسمانی نزیك لە ئێوەمان بە چراخان جوان كردوەو كردویشمانە بە دەمكوت بۆ شەیتانەكانو ئامادەیشمان كردوە بۆیان سزایەكی گڵپەدار.

﴿٦﴾ ئەوسا بۆ ئەوانەی كە باوەڕیان بە پەروەردگاری خۆیان نیە سزای دۆزەخ هەیەو چ خراپە ئەو سەرئەنجامە بۆیان كە دۆزەخو ئاگرو ئاوی گەرمە،

﴿٧﴾ هەر كاتێك فڕەبدرێنە ناویەوە گوێیان لە ناڵەو نركەیەتیو هەر دەكوڵێت.

﴿٨﴾ نزیكە لە داخی تاوانباران شەق ببات كەهەر كاتێك كۆمەڵێكی تێ فڕەبدرێت، سەرپەرشتیاری دۆزەخ پرسیاریان لێدەكات كە ئایا ترسێنەر نەهاتە لاتانو باسی سەرئەنجامی خراپەكانتانی بۆ نەكردن؟

﴿٩﴾ وتیان: بەڕێ وە(اللَّه)ی ترسێنەر هاتە لامان بەڵام ئێمە باوەڕمان پێنەكردنو وتمان خوا هیچی نەناردوەو ئێوە هەروان لەناو سەرلێشێواویەكی زۆرگەورەدا.

(١٠) وتیان: ئەگەر بمانبیستایەو ژیری خۆمان بەکار بهێنایەو باش حاڵی بوینایە، ئێستا ئێمە لەناو یارانی ناو گڵپەی ئاگردا نەدەبوین. بەڵێ: تاوانباران کە لە دنیادا گەمە بە باوەڕداران دەکەن‌وبەسادەونەزانیان دادەنێن‌و خۆیان بە ژیر دەزانن، لەوێدا دان بەگێلی‌و گەمژەیی خۆیاندا دەنێن بەڵام تازە ئەوئیعتیراف‌و دان پێدا نانە هیچ سودێکیان پێنادات.

(١١) جا لەوێدا دان بەگوناهەکانی خۆیاندا دەنێن، چونکە بەنوسراوی‌و بەوێنەو بەتەسجیل کراوی دەیخەنە رویان‌و بێجگە لەدان پێدانان هیچ چارەیەکی تریان نیە، ئەوسا پێیان دەوترێت: دووری لە رەحمەتی خوا بۆ ئەوانەی کە یارانی گڵپەی ئاگرن‌و دۆزەخین.

(١٢) بێگومان ئەو کەسانەی کە لە پەنامەکیدا لە پەروەردگاری خۆیان دەترسن لێخۆشبون‌و پاداشتی گەورەیان بۆهەیە لەلایەن پەروەردگاریانەوە.

(١٣) ئەوسا قسەکانتان بشارنەوە یان ئاشکرای بکەن لەلای ﷲ یەکسانەو پێیدەزانێت، بێگومان ئەو زانایە بەوەی کە لەناو دڵەکاندایە،

(١٤) ئایا دەگونجێت ئەو کەسەی کە خۆی دروستکەرە نەزانێت بەوەی کە دروستیکردوە؟ خۆ هەر خۆیشیەتی وردبین‌و زۆر بەئاگاهـ.

وتراوە ﴿ٱللَّطِيفُ﴾ واتە: ئەو زاتە کە ئاگاداری بە هەموشت هەیەو جا بە حیکمەت‌و زانایەو لەسەرخۆی بەڕێوەیان دەبات.

(١٥) خۆی ئەو زاتەیە کە زەوی رامکردوە بۆ ئێوە، جا بە هەموو گۆشەو کەنارێکدا بگەڕێن‌و لە ڕۆزی ئەو زاتە بخۆن‌و گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە. لێرەدا داوادەکات کە مرۆڤ جموجوڵ بکات بۆ پەیداکردنی ڕۆزی خۆی، ئەمە دژی تەوەکول نیەو دەیخاتە پێش چاومانەوە کە هەر ئەم زەویەی کە بەفەرمانی پەروەردگار رامکراوە دەشتوانێت بیکات بەئامێرێك بۆ سزا دانی مرۆڤ.

(١٦) ئایا ئێوە بێترسن لەو زاتەی کە لە سەر ئاسماندایە کە بەناو زەویدا بتانباتە خوارەوە، جا لەپڕدا زەوی بلەرزێت کە کەس فریای هیچ نەکەوێت؟ ئەم جۆرە چونەخوارەوە بەهۆی لەرزینی زەویە زۆرجار ڕویداوەو لەمەولاش زیاتر دەبێت، دەی بۆچی ئەوەندە لاسارو بێگوێن؟!

(١٧) ئایا ئێوە بێترسن لەو زاتەی کە لەسەر ئاسماندایە کە بەرد بارانتان بکات، جا بەم زوانە دەزانن کە چۆن بو ترساندن‌و سزای من بۆتان. ئەوسا چاوتان بەخۆتان دەکەوێ.

(١٨) بە حەقیقەت ئەوانەی پێش ئەوانیش باوەڕیان نەهێنا، جا بزانە چۆن بو دژمنایەتی من بۆیان‌و چیان بەسەر هات، بۆچی ئەمانەی ئومەتی تۆش بیر لەوانە ناکەنەوە لەو نەزانی‌و نەفامیە دەست بکێشنەوە؟!

(١٩) ئایا ئەوان نابینن ئەو باڵندانەی کە لەسەریانەوەن چۆن باڵیان پان دەکەنەوەو پاش ئەوەش دەیلکێنن بەخۆیانەوە، جگە لە رەحمان هیچ کەسێکی تر ڕایان ناگرێت بە ئاسمانەوە، بێگومان کە ئەو بینەری هەمو شتێکەو هیچی لەپێش چاو ون نابێت.

(٢٠) ئایا جگە لە رەحمان کێیە ئەو کەسەی کە سەربازی ئێوە بێت‌و یارمەتیتان بدات؟ بەڕاستی کەسێکی ترتان نیە، خوانەناسان هەمیشە هەر لەناو لوتبەرزی‌وغەڕایی خۆیاندان، جا لەراستیدا ئەوان خەڵەتاون و بە هۆی نەفامی خۆیانەوە لەراستی دورخراون.

(٢١) ئەگەر ئەو ڕۆزی لێ گرتنەوە ئەوە کێیە کە ڕۆزی ئێوە بدات؟ هیچکەس نیە. بەڵکو ئەوان لە سەرکەشی‌و لە دوورکەوتنەوەدان‌و نایانەوێت خۆشبەخت ببن.

(٢٢) ئایا ئەو کەسەی بەسەر دەموچاویدا بڕوات باشتر ڕێگا دەزانێت یان ئەو کەسەی کە بە ڕێك‌وپێکی‌و ڕاوەستاوی بەسەر ڕێگای ڕاستدا بڕوات؟ ئەمە وێنە بێباوەڕو باوەڕدارەو کە لەم دنیادا بەم شێوەن‌و لەدوارۆژیشدا هەروان، ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: {أَنَّ رَجُلًا قَالَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ كَيْفَ يُحْشَرُ الْكَافِرُ عَلَى وَجْهِهِ قَالَ أَلَيْسَ الَّذِي أَمْشَاهُ عَلَى الرِّجْلَيْنِ فِي الدُّنْيَا قَادِرًا عَلَى أَنْ يُمْشِيَهُ عَلَى وَجْهِهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ /متفق عليه/ بێگومان پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوا خوانەناس چۆن بەسەر دەم وچاویدا کۆدەکرێتەوە؟ فەرموی: ئایا ئەوکەسەی کە لەدنیادا بەسەر قاچیدا دەیبات ناتوانێت لەرۆژی قیامەتدا بەسەر دەمو چاویدا بیبات؟} پاداشت بەگوێرەی کردارە ئەوان لەدنیادا چاکیان بەخراپ داناوەو خراپیش بەچاك، جا لەوێدا بۆ ڕۆیشتن سەرو بن دەکرێن تا هەر بە بینینیان بناسرێنەوە.

(٢٣) بڵێ خۆی هەر ئەو زاتەیە کە ئێوەی لە سەرەتاوە بەدیهێناوەو گوێ‌و چاوو دڵانی بۆ ئێوە داناوە تا شت ببیستن و ببینن‌و لێی تێبگەن، بەڵام ئێوە کەمتر سوپاسی خودا دەکەن. ئەو نیعمەتانەی کەپێمان دراوە ئەمانەتن‌و دەبێ بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکانی پەروەردگار بەکاریان بهێنین تا خودا لەخۆمان رازی بکەین، ئەگینا خیانەتمان لەئەمانەت کردوە .

(٢٤) بڵێ: ئەو خۆیەتی کە لەم زەویەدا دروستیکردون‌و سەر ئەنجامیش هەر بۆ لای ئەو کۆ دەکرێنەوە.

فَلَمَّا رَأَوۡهُ زُلۡفَةٗ سِيٓـَٔتۡ وُجُوهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَقِيلَ هَٰذَا ٱلَّذِي كُنتُم بِهِۦ تَدَّعُونَ ﴿٢٧﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَهۡلَكَنِيَ ٱللَّهُ وَمَن مَّعِيَ أَوۡ رَحِمَنَا فَمَن يُجِيرُ ٱلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٍ أَلِيمٖ ﴿٢٨﴾ قُلۡ هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ءَامَنَّا بِهِۦ وَعَلَيۡهِ تَوَكَّلۡنَاۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ هُوَ فِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٖ ﴿٢٩﴾ قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ غَوۡرٗا فَمَن يَأۡتِيكُم بِمَآءٖ مَّعِينِۭ ﴿٣٠﴾

## سُورَةُ القَلَمِ ٦٨ ٥٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

نٓۚ وَٱلۡقَلَمِ وَمَا يَسۡطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعۡمَةِ رَبِّكَ بِمَجۡنُونٖ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجۡرًا غَيۡرَ مَمۡنُونٖ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٖ ﴿٤﴾ فَسَتُبۡصِرُ وَيُبۡصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلۡمَفۡتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿٧﴾ فَلَا تُطِعِ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ﴿٨﴾ وَدُّواْ لَوۡ تُدۡهِنُ فَيُدۡهِنُونَ ﴿٩﴾ وَلَا تُطِعۡ كُلَّ حَلَّافٖ مَّهِينٍ ﴿١٠﴾ هَمَّازٖ مَّشَّآءِۭ بِنَمِيمٖ ﴿١١﴾ مَّنَّاعٖ لِّلۡخَيۡرِ مُعۡتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ عُتُلِّۭ بَعۡدَ ذَٰلِكَ زَنِيمٍ ﴿١٣﴾ أَن كَانَ ذَا مَالٖ وَبَنِينَ ﴿١٤﴾ إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٥﴾

(٢٥) جا ئەو خوانەناسانە دەڵێن: ئەگەر ڕاست دەکەن کەی ئەو هەڕەشانەی کە وتوتانە ڕودەدەن و کەی ئەوبەڵێنە دێتە دی؟

(٢٦) بڵێ: زانینی کاتی هاتنی ئەو هەڕەشانە هەر لەلای خودایەو من هەر ترسێنەرێکی ئاشکرام بۆ ئێوە. واتە ناتوانم لەو بارەوە هیچ بڕیارێك بدەمو نازانم کەی دێت.

(٢٧) ئەوسا کە ئەو هەڕەشەیان لە نزیکەوە بیست، ئەو کاتە ڕوی خوا نەناسان ڕەش دەبێتو دەوترێت ئەمەیە ئەو شتەی کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد

(٢٨) بڵێ: پیشانم بدەن بزانم ئەگەر خوا منو ئەوەی لەگەڵمدایە لەناوی ببات یان بەزەیی پێماندا بێتەوەو لێمان ببورێتو سزامان نەدات ئەوسا کێ خوانەناسان لە سزای بەژان دەپارێزێت؟ واتە ئەی بێباوەڕان کە چاوەڕوانی مردنی منو باوەڕدان دەکەن لە مان یان نەمانی ئێمە، ئێوە چ سودێکتان دەستدەکەوێت دەبا، بگەڕێنەوە بۆ ڕێگای ڕاستو واز لە کوفر بهێنن، چونکە کەس ناتوانێت کافران لەسزای پەروەردگار بپارێزێت یان کەوابو هەوڵی ئەوە بدەن خوا خۆتان ڕزگار بکات، نەك هەر ئاواتتان ئەوە بێت کە خواناسان دوچاری سزابین ؟!

(٢٩) بڵێ ئەو خۆی ڕەحمانەو باوەڕمان پێی هەیەو هەر بەو پشت دەبەستین، جا بەم زوانە دەزانن کە کێیە ئەو کەسەی لە گومڕایی ئاشکرادایەو کێیە کە بە خۆشبەختی پاشەڕۆژ دەگات.

(٣٠) بڵێ: پێم بڵێن ئەگەر ئەو ئاوەی کە سەرچاوەی ژیانتانە بە ناخی زەویدا بچێتە خوارەوەو هیچی بۆ سەرنەیەت، ئەوسا کێیە کە ئاوی هەڵقوڵاو و کانی ئاوی بەتامو چاکتان لەناو ئەو خاکەدا بۆ دەردەهێنێت؟ جگە لە خوا کەس نیەو کەسیش ناتوانێت قومە ئاوێکی بێ خاكو خۆڵمان لەو زەویەدا بۆ دەربهێنێت، ئەگەر خوا ئاوەکان بەناخی زەویدا بباتە خوارەوە. بیربکەنەوەو لەخوا بترسنو لەو ئامۆژگاریە بەنرخانەی سود وەرگرن.

وشەی (صدر/ سینگەو مەبەستی دڵە، ئەمە بزانە بۆ هەمو شوێنەکانی تری لەم بابەتە، ناوبردنی شتە بەناو جێگەکەیەوە/تسمية الشيء باسم المحل).

## سورەتی قەڵەم ٦٨ ٥٢

سورەتی قەڵەم کە سورەتی شەستو هەشتەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، پەنجاو دوو ئایەتەو سورەتی (ن)یشی پێدەوترێت. لەو سورەتانەیە کە لە سەرەتای پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمانەوەﷺ دابەزیوە. وتراوە ئایەتی چل و چوارو ئایەتی چلو هەشتی بە ئایەتی (فرمان بەغەزا) نەسخ بونەتەوە. لە سورەتی پێشودا کە باس لە دەسەڵاتی پەروەردگارو لە ناوچونی نیعمەتەکانی بە هۆی ناسوپاسی بەندەکانیەوە کرا، لەم سورەتەشدا بەسەرهاتی خاوەن بێستانانێك باسدەکات کە بەخێڵی روی تێکردنوپەروەردگاریان لەبیرچو، جا پەروەردگار ئەو نیعمەتەی لەناوبردن، هەروەك لە سورەتی پێشودا بە وشەی: ﴿إِنۡ أَصۡبَحَ مَآؤُكُمۡ﴾ ئاماژە بەوەدەکات کە چونی ئاوەکان بەناخی زەویدا لە شەودا ڕودەدات هەروەك چۆن لەناوچونی بێستانەکەی ئەمانەی کە لەم سورەتەدا باسیان دەکات لە کاتی شەودا ڕوی داوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ﴿نٓ﴾ لەو پیتانەیە کە لە سەرەتای هەندێك لە سورەتەکانەوە هاتوە کە ئەمە کۆتاییانە، زۆربەی زانایانی تەفسیر وتویانە هەر خوا خۆی دەزانێت مەبەستی چیە، هەندێکیش مانایان کردوە، سوێند بە قەڵەم کە یەکەم دروستکراوی خۆیەتیو سوێند بەو دێڕانەی کە دەینوسن چ تۆمارکردنی قەڵەم بێت لە سەرەتاوە بۆ هەمو تەقدیرات چ نوسینی فریشتەکان بێت سەبارەت بە کردارو ڕۆژیو ماوەی تەمەنەکان یان هەر نوسینێك بێتو هی هەر کەس بێت کە بەڵگەی ژیریو لێزانی ئەم دروستکراوەی خوای خاوەن دەسەڵاتە.

عوبادەی کوڕی سابت دەڵێت بیستم لە پێغەمبەرەوەﷺ کە فەرموی: { إِنَّ أَوَّلَ مَا خَلَقَ اللَّهُ الْقَلَمَ فَقَالَ لَهُ اكْتُبْ قَالَ رَبِّ وَمَاذَا أَكْتُبُ قَالَ اكْتُبْ مَقَادِيرَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى تَقُومَ السَّاعَةُ / ابوداود، صحيح

الألباني/ بێگومان یەکەم شتێ کە خوا دروستیکردوە قەڵەم بو، جا فەرموی: بنوسە وتی: ئەی پەروەردگارم ئامادەمو چی بنوسم؟ فەرموی: ئەندازەکانی هەمو شتێك هەتا قیامەت دێت، بنوسە }

(٢) خوا سوێند بە قەڵەمو بەو نوسینانە دەخوات ،کە تۆ ئەی محمد ﷺبەهۆی چاکەی پەروەردگارتەوە شێت نیت.

(٣) بێگومان بۆ تۆ پاداشتێکی نەبڕاوە هەیە.

(٤) جا بێشك تۆ لەسەر ڕەوشتێکی گەورەو بەرزی کە ڕەوشتیشی ئەو قورئانە بوە واتە تۆ لەسەر ئایینێکی گەورەیت، هەروەکو دایکی باوەڕداران عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) وتویەتی:{ خُلُقُهُ القُرْآنُ/مُسلِمٌ وَغَيْرُهُ/ ڕەوشتی هەر ئەو قورئان بوە} واتە، ئەو پێغەمبەرە ﷺخۆی قورئانێکی زیندو بووە.

(٥) ئەوسا بەم زوانە تۆ دەبینیتو ئەوانیش چاویان پێدەکەوێت جا ئەوکاتەدەزانن.

(٦)کە بە کامتانەوە شێتی هەیە.

(٧) بێگومان پەروەردگارت هەر خۆی زاناترە بەو کەسەی کە لە ڕێگای ئەو لایداوەو هەر خۆیشی زاناترە بەو کەسەی کە ڕێگای خۆش بەختی گرتووەتە بەر، تۆ پێغەمبەری ئەو زاتەیتو لە تانەو تەشەرو قسەی پڕوپوچی ئەوان دڵتەنگو نائومێد مەبە خۆ ﷻ بێ ئاگانیە لەوان.

(٨)ئەوسا بەگوێی بێباوەڕان مەکە کە داوات لێدەکەن عەیبو عاری خواکانیانو پڕوپوچی ئاینەکایان باس نەکەیتو بێدەنگ بیت تازیاتر ڕسوانەبن.

(٩)ئەوان زۆریان پێخۆشە کە تۆ لەگەڵ ئەواندا بگونجێیتو لەسەر هەندێ لەوەی کە ئەوان باوەڕیان پێی هەیە لەگەڵیاندا ڕێك بکەویت یان لای کەم بێدەنگ بیت لەسەری، جا ئەوانیش ئەوکاتە خۆیان شل دەکەنەوەو هەوڵ دەدەن کەلەگەڵتدا بگونجێن، واتە ئەوانە ماندوو هەراسانن لە پیرۆزیو جموجۆڵی ڕاستی کە بە هەمو شێوەیەك دژایەتیان کردوە ، بەڵام زۆری نەبردوە بە سەریاندا شکاوەتەوەو بینویانە کە دەستکەوتێکیان نەبوە، چونکە خوا خۆی یارمەتی ئایینی خۆی دەداتو هەمیشە کەسانی چالاكو گیان فیداو نەبەزی بۆ دروست دەکاتو دەبێت بە سپێرێك لەبەردەم تەوژمی نەفامیو خوانەناسیو بێ بەندوباریدا کەلەلای ئەوان ئەمەشتێکی چاکە و پێشکەوتنەو بێ ئاگان لەوەی کە ئەمانە قەوانە کۆنە ڕزیوەکانی سەردەمی نەفامینو لەسەر دەستی پێغەمبەرانو پیاوچاکان بەهەزاران جار

سَنَسِمُهُۥ عَلَى ٱلْخُرْطُومِ ﴿١٦﴾ إِنَّا بَلَوْنَٰهُمْ كَمَا بَلَوْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا۟ لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ ﴿١٧﴾ وَلَا يَسْتَثْنُونَ ﴿١٨﴾ فَطَافَ عَلَيْهَا طَآئِفٌ مِّن رَّبِّكَ وَهُمْ نَآئِمُونَ ﴿١٩﴾ فَأَصْبَحَتْ كَٱلصَّرِيمِ ﴿٢٠﴾ فَتَنَادَوْا۟ مُصْبِحِينَ ﴿٢١﴾ أَنِ ٱغْدُوا۟ عَلَىٰ حَرْثِكُمْ إِن كُنتُمْ صَٰرِمِينَ ﴿٢٢﴾ فَٱنطَلَقُوا۟ وَهُمْ يَتَخَٰفَتُونَ ﴿٢٣﴾ أَن لَّا يَدْخُلَنَّهَا ٱلْيَوْمَ عَلَيْكُم مِّسْكِينٌ ﴿٢٤﴾ وَغَدَوْا۟ عَلَىٰ حَرْدٍ قَٰدِرِينَ ﴿٢٥﴾ فَلَمَّا رَأَوْهَا قَالُوٓا۟ إِنَّا لَضَآلُّونَ ﴿٢٦﴾ بَلْ نَحْنُ مَحْرُومُونَ ﴿٢٧﴾ قَالَ أَوْسَطُهُمْ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ لَوْلَا تُسَبِّحُونَ ﴿٢٨﴾ قَالُوا۟ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِنَّا كُنَّا ظَٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾ فَأَقْبَلَ بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ يَتَلَٰوَمُونَ ﴿٣٠﴾ قَالُوا۟ يَٰوَيْلَنَآ إِنَّا كُنَّا طَٰغِينَ ﴿٣١﴾ عَسَىٰ رَبُّنَآ أَن يُبْدِلَنَا خَيْرًا مِّنْهَآ إِنَّآ إِلَىٰ رَبِّنَا رَٰغِبُونَ ﴿٣٢﴾ كَذَٰلِكَ ٱلْعَذَابُ ۖ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٣٣﴾ إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٣٤﴾ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ أَمْ لَكُمْ كِتَٰبٌ فِيهِ تَدْرُسُونَ ﴿٣٧﴾ إِنَّ لَكُمْ فِيهِ لَمَا تَخَيَّرُونَ ﴿٣٨﴾ أَمْ لَكُمْ أَيْمَٰنٌ عَلَيْنَا بَٰلِغَةٌ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ۙ إِنَّ لَكُمْ لَمَا تَحْكُمُونَ ﴿٣٩﴾ سَلْهُمْ أَيُّهُم بِذَٰلِكَ زَعِيمٌ ﴿٤٠﴾ أَمْ لَهُمْ شُرَكَآءُ فَلْيَأْتُوا۟ بِشُرَكَآئِهِمْ إِن كَانُوا۟ صَٰدِقِينَ ﴿٤١﴾ يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾

گۆڕ کراون، بەڵام شەیتانو دارو دەستەکەی هەمیشە ئەومردوە زیندو دەکەنەوەو بە پۆشاکێکی نوێ دایدەپۆشنو مرۆڤە سادەو ساویلکەکانی پێ فریو دەدەنو بەشتێکی پیرۆزی سەردەم کاوێژی دەکەنەوە! دەیانەوێت کە هەلگری ئەم پەیامە خواییە هێورو شل بکەنەوە تا ئەوانیش وچانێك بدەنو پەڕو باڵێکی زیاتر بۆ خۆیان دروست بکەن، جا خوا دەفەرموێ:

(١٠)نەکەی بەگوێی هیچ سوێند خۆرێکی سوك بکەیت.

(١١)کە هەمیشە خەریکی عەیب و عار دروستکردنە بۆ خواناسان، هەمیشە خەریکی دووزمانیە.

(١٢)زۆر ڕێگرە لە چاکەو دەستدرێژیکەرە، زۆرگوناهبارە.

(١٣) وشکی دڵڕەقە پاش ئەو هەمو وەسفە ناشیرینانەش زۆڵەو خۆی سەپاندوە بەسەر ئەو بنەماڵەدا ، تا خۆی بەو بنەچەیە کە بەدرۆ خۆی سەپاندوەبەسەریاندا پلەوناوی خۆی بەرز بکاتەوە.

(١٤)ئەو دژایەتیەشی لەبەرئەوەیە چونکە خاوەنی ماڵو کوڕانەو بەوانە لەخۆی باییبوەوخۆی بێنیاز دەزانێت.

(١٥) هەر کاتێك نیشانەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە لەباتی بیر کردنەوەو سودوەرگرتن دەڵێت: داستانە پڕو پوچەکانی پێشینانە.

(١٦) ئێمەش بەم زوانە مۆرێك دەنێین بە لوتیدا (لێرەدا وێنەی ئەو بەدكارەی وەكو كەركەدەنگ پیشانداوە ، چونكە ئەو خرتومی هەیە (لوتی درێژ) بەڕاستی مرۆڤ دەبێت لە خوا بترسێت، چونكە هەر كەسێك دژایەتی خواو پێغەمبەر ﷺو بەرنامەكەی بكاتو لە سنور تێپەڕێت، بەدڵنیاییەوە ئەو كەسە خوا ئابڕوی دەبات هەروەك لەم سەردەمەیش چەندین كەسی ئاوامان دیو بینیمان چیان بەسەر هاتو چۆن هەرلە دنیادا ﷲ ﷻ سزای گاڵتە پێكەری خۆی بەسەردادان، لەڕاستیدا ئەوەشتێكی زۆر كەمە لە سزای گەورە لە دوارۆژدا دەبێت، خوا دەفەرموێ:﴿بەدڵنیاییەوەپێش هاتنی سزای گەورەترسزای دنیایان پێدەچەژین بەڵكو لە خراپە و تاوان بگەڕێنەوە﴾ سەجدە:٢١ .

(١٧) بێگومان ئێمە ئەوانمان تاقیكردەوە بە بێ بارانیو قاتوقڕی هەروەكو چۆن خاوەنی ئەو باخچەیەمان تاقیكردەوە كاتێك كە سوێندیان خوارد كە ئەو باخەیان بەیانی زوو بۆ خۆیان بچنن‌و بەشی كەسی لێ نەدەن.

(١٨) جا (إنشاء الله)یشیان نەكرد.

(١٩) ئەوسا كە ئەوان هەر لە خەودا بون لەلایەن پەروەردگارتەوە بەڵایەك دای بەسەر ئەو باخەداو سوتاندی.

(٢٠) جا هەروەكو چەرمی ڕەشی لێكرد.

(٢١) جا بەیانی كە لە خەو هەستان بانگی یەكتر یان كرد.

(٢٢) كە بەیەكتریان وت: ئەگەر دەتانەوێت میوەی خۆتان بچنن‌و كەس پێتان نەزانێت دەی بابەم بەیانیە زووە بگەنە سەر باخەكەتان.

(٢٣) جا ئەوان ڕۆیشتن و لەنێوان خۆیاندا بەچپە قسەیان دەكرد.

(٢٤) دەیان وت: نابێ هیچ هەژارێك ئەمڕۆ پێتان بزانێت‌و بێتە ناو ئەم باخەوە بۆئەوەی كە خۆمان شتێكی زۆرمان بەركەوێت.

(٢٥) بەیانی زوو ڕۆین‌و پێیان وابو كە دەتوانن بەرگری فەقیر لەو باخە بكەن تاهەموی هەر بۆ خۆیان بێت.

(٢٦) جا لەكاتێكدا كە چون‌و ئەو باخەیان بینی كە هەموی سووتاوەو هیچ شینایەكی تێدا نەماوەو هەموی ڕەش بوەتەوە ، كە لە باخ ناكات وتیان: بەڕاستی ئێمە ڕێگامان هەڵەكردوە، پاش وردبوونەوەیەك زانیان ڕاست هاتون‌و هەر ئەمەیە باخەكەیان كە وای بەسەرهاتوەوهەموی سووتاوە.

(٢٧) وتیان: نەخێر ڕێمان لێ ون نەبوە بەڵكو نائومێدو بێبەشكراوین. ئینجا هەستیان بەخراپی نیەتەكەیانكرد،

(٢٨) باشترین كەسیان وتی: ئەی من پێم نەوتن ئێوە تەسبیحات بكەن‌و ﷲ بە بێعەیبو بە بێنیاز بزانن‌و لەو هەڵوێستە ناڕێك‌و دور لە ڕەوشتی خوا پەرستایەتی پەشیمان ببنەوە؛

(٢٩) وتیان: پاك‌و بێ عەیبە پەروەردگارمان، بێگومان ئێمەین ستەمكارلەخۆمان‌وكەس‌وكاروهەژاران.

(٣٠) جا لەسەر ئەوبڕیارە خراپەیان هەندێكیان ڕووی گازندە و سەرزەنشتیان لە هەندێكیان كردولۆمەی یەكتریان دەكرد.

(٣١) وتیان: وای بۆ ئێمە بێگومان كە ئێمە ناحەقیمان كرد كە ئەو بڕیارەمان دا كەبەشی هەژاران لەوباخە نەدەین‌و بەرهەمەكەی هەموی هەر بۆ خۆمان بێت.

(٣٢) نزیكە بەهۆی پەشیمان بونەوەمان پەروەردگارمان چاكتر لەم باخەمان پێبدات، بێگومان ئێمە هەر ڕومان لە پەروەردگاری خۆمانە. دەڵێن ئەمانە خەڵكی شاری زەروان لە شەش كیلۆمەتری سەنعادا بوون، هەندێك دەڵێن: خەڵكی حەبەشە بوون ، كە باوكیان ئەو باخچەیەی بۆ بەجێ هێشتبون‌و خاوەنی پەڕاو بوون، بەشێوەیەكی جوان باوكیان لەو باخە ڕەفتای دەكرد، بەشێكی لەناو باخەكەدا بۆ كەسانێك كە بەناویدا هاتوچۆ بكەن تا سودی لێ وەرگرن‌و بەشی ساڵێكی ماڵ‌و منداڵی خۆی لێهەڵدەگرت‌و باقی دەدا بە فەقیرو كەمدەستان، پاش خۆی منداڵەكانی وتیان: باوكمان نەزان بوە شتی وای كردوەو بەشی فەقیرو كەمدەستانی داوە ، ئێمە ئەو بەشە نادەین تا خۆمان سوودی زیاترمان دەستكەوێت ، بەڵام خوا بەدژی بۆچونەكەی خۆیان سزای دان‌و بە ئاگری قودرەتی خۆی ئەو باخەی سوتاندو بەشبراوونائومێدی كردن ، ئیتر ئەو كوڕانەی نەخۆیان‌و نە خەڵك لەو باخچەیە، جگە لە نەمان‌و نائومێدی سوودێكی تریاندەست نەكەوت.

(٣٣) هەر ئاوەهایە سزای خودا بۆ ستەمكاران‌و بێڕەحمان، بێگومان ئەگەر ئەوانە بزانن سزای ڕۆژی دوای لەمەش گەورەترە. ئینجا پاش باسی سزای تاوانباران جا پەروەردگار باسی پارێزكاران دەكات‌و دەفەرموێ:

(٣٤) بێگومان بۆ پارێزكاران لەلای پەروەردگاری خۆیان باخچەگەلی نازو نیعمەت هەیە نە لەناودەچێتونە خراپ دەبێتو نە لێیشیان قەدەغە دەكرێت.ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٣٥) ئایا ئێمە، موسڵمانان وەك تاوانباران دادەنێین؟ وەكو یەك حیسابیان بۆ دەكەین؟ نەخێر.

(٣٦) چیتانەو چۆن ئاوا بڕیارێك دەدەن كەئێمە چاك و خراپ وەك یەك تەماشاكەین؟!

(٣٧) ئەوەش هیچ، ئایا ئێوە پەڕاوێكتان هەیە كە بیخوێننەوە كە لەناوایدا ئەوە نوسرابێت؟

(٣٨) كە بێگومان ئێوە چیتان دەوێت لەم دنیادا ئەوە هەڵبژێرنو ئەو دنیایش هەر بە ئارەزۆی ئێوە بێت؟

(٣٩) ئەوەش واز لێ بێنە، ئایا بۆ ئێوە هەیە لەسەر ئێمە پەیمانێكی بتەو كە هەتا قیامەت كەلەودا وتبێتمان: بێگومان بۆ ئێوە هەیە ئەو بڕیارەی كە دەیدەن؟ واتە، هەرخۆتان خاوەنی بڕیارن و كەس قسە لە قسەتاندا نەكات؟ شتی واهەیە؟

(٤٠) دەی پرسیاریان لێ بكە بزانە كامیان بەو ئەركە هەڵدەستێتو ئەوقسانەیان بۆ دەباتەسەر؟

(٤١) ئەوەش واز لێ بێنە، ئایا هاوبەشانێكیان لەلای خوا هەیە كە ئەوەی مەبەستی ئەوانبێت وایان بۆبكات؟ ئەگەر ڕاست دەكەنو هەیانە دەبا بیهێنن.

(٤٢) جا ﷲ كاتێك فەرموی بۆ پارێزكاران باخچەیانو نازو نیعمەت هەیە، ئەوە ڕۆشن دەكاتەوە كە كەی ئەو شتە بەنرخە دەبێتو دەفەرموێت: ئەو ڕۆژەیە كە لاق ڕووت دەكرێت، واتە: ڕۆژی قیامەتو ئەو ڕوداوە گرینگانەی ئەو كاتە لە بومەلەرزەكانو تاقیكردنەوەكانو ئەو كارەساتو بەڵا گەورانەی كە لەو كاتەدا پەیدادەبن، جا ئەو كاتە بانگ دەكرێن بۆ سوجدە دووڕووەكان ناتوانن سوجدە ببەن.

لە فەرمودەی سەحیحدا هاتوە كە ئەبو سەعیدی خدری دەڵێت: لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیستم كە دەیفەرمو: {یَكشِفُ رَبُّنا عَن سَاقِهِ فَیَسجُدُ لَهُ كُلُّ مُؤمِنٍ وَمُؤمِنَةٍ، وَیَبقَى مَن كَانَ یَسجُدُ فِي الدُّنیا رِیَاءً وَسُمعَةً فَیَذهَبُ لِیَسجُدَ فَیَعُودُ ظَهرُهُ طَبَقاً وَاحِداً/ پەروەردگارمان قاچی خۆی (كەچونیەتیەكەی نادیارەو بەوشێوەیە كە شایانی ئەو زاتەیە) دەردەخات ، ئەو كاتە هەمو پیاو و ژنێكی باوەڕدار سوجدە دەبەن بۆ ﷲ، دەمێنێتەوە ئەو كەسەی كە لە دنیادا

خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۖ وَقَدۡ كَانُواْ يُدۡعَوۡنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ وَهُمۡ سَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٤٤﴾ وَأُمۡلِي لَهُمۡۚ إِنَّ كَيۡدِي مَتِينٌ ﴿٤٥﴾ أَمۡ تَسۡـَٔلُهُمۡ أَجۡرٗا فَهُم مِّن مَّغۡرَمٖ مُّثۡقَلُونَ ﴿٤٦﴾ أَمۡ عِندَهُمُ ٱلۡغَيۡبُ فَهُمۡ يَكۡتُبُونَ ﴿٤٧﴾ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تَكُن كَصَاحِبِ ٱلۡحُوتِ إِذۡ نَادَىٰ وَهُوَ مَكۡظُومٞ ﴿٤٨﴾ لَّوۡلَآ أَن تَدَٰرَكَهُۥ نِعۡمَةٞ مِّن رَّبِّهِۦ لَنُبِذَ بِٱلۡعَرَآءِ وَهُوَ مَذۡمُومٞ ﴿٤٩﴾ فَٱجۡتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَجَعَلَهُۥ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ﴿٥١﴾ وَمَا هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٥٢﴾

## ٦٩ سُورَةُ الحَاقَّةِ ٥٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَآقَّةُ ﴿١﴾ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحَآقَّةُ ﴿٣﴾ كَذَّبَتۡ ثَمُودُ وَعَادُۢ بِٱلۡقَارِعَةِ ﴿٤﴾ فَأَمَّا ثَمُودُ فَأُهۡلِكُواْ بِٱلطَّاغِيَةِ ﴿٥﴾ وَأَمَّا عَادٞ فَأُهۡلِكُواْ بِرِيحٖ صَرۡصَرٍ عَاتِيَةٖ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيۡهِمۡ سَبۡعَ لَيَالٖ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومٗاۖ فَتَرَى ٱلۡقَوۡمَ فِيهَا صَرۡعَىٰ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ خَاوِيَةٖ ﴿٧﴾ فَهَلۡ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٖ ﴿٨﴾

نوێژكردنەكەی تەنها بۆ خۆپیشاندانو ناوو شۆرەت بوە ، جا ئەوە كاتێك دەیەوێت سوجدە ببات پشتی دەبێت بەیەك تەختەو ناتوانێت سوجدە ببات} .

(٤٣) چاوشۆڕنو دوچاری سەركزی بوونو بە حەقیقەت ئەوانە لە دنیادا كە ساغو سەلامەت بون بانگكران بۆ سوجدە بردنو نوێژكردن بەڵام گوێیان بەو بانگەوازە ڕاستەقینە نەدا. واتە: ئەمرۆ شەرمەندەو سەرشۆڕن، ئەمەش بەڵگەی سۆزی خودایە بۆ بەندەكانی پێش دوچاربونیان بە تەنگو چەڵەمە ڕێگایان بۆ ڕون دەكاتەوەو حەقیقەتی سەرئەنجامیان بۆ باسدەكات، تا بەڵكو بیربكەنەوەو بەو سەرئەنجامە خراپە گرفتار نەبن، بەڵام زۆربەی پەیڕەوی ڕاستی ناكاتو بەدوای ڕاستیدا ناگەڕێت. ئینجا ﷲ هەڕەشەدەكاتو دەفەرموێ:

(٤٤) ساتۆ (ئەی محمد)وازم لێ بێنە بۆ ئەو كەسەی كە باوەڕ بەم قورئانە ناكات هێواش هێواش لێی دەگۆڕین تا دەیخەینە داوەوە بێ ئەوەی خۆی هەست بە هیچ بكات.

(٤٥) جا ماوەیشیان پێدەدەم بێگومان كە فێڵی من بەوان زۆر سەختو ئاڵۆزەو لێی دەرباز نابن .

(كید – مكر) بە مانای ئەنجامدانی كارێكە لە پشت پەردەوە دەرحەق بە كەسێك كە خۆی نەزانێ هەتا دەكەوێتە ناو داوەكەوە، لە دنیادا ئەو كەسانەی ئەوە دەكەن لە ترسا پێویستیان

بەو کارە هەیە، بەڵام خوا زۆربەی سزاو تۆڵەکانی هەر ئاوایە ، چونکە کەس نازانێت خودا چی دەکات تا بەڵاکە دادەبەزێت نەك ئەمە لە ترسا بێت، بەڵکو لەبەر شاراوەیی کارەکەیەو شێوەی (مەکر، یان -کید- یان حیلە)ی هەیە لەبەر شێوەیەکەیەتی ، بۆیە ئەو کارانەی ﷲ بەو ناوە باسکراوە ئەگینا ﷲ لە کەس ناترسێتو هیچ شتێکیش ناتوانێت ببێت بە بەرپەرچ لە ڕێگای فەرمانەکانیدا، جا ئەمە بە (المُشَاکَلە/ هاوشێوەیی) ناو دەبرێت.

(٤٦) واز لەوەش بهێنە، ئایا تۆ لەسەر ئەم بانگەوازەت داوای کرێوپاداشتیان لێ دەکەیت، جا ئیتر ئەوانیش لەبەر ئەو پاداشتە باریان گران بێتو نەتوانن بیدەن، بۆیە باوەڕ پێناکەن؟

(٤٧) یان لەلای ئەوان (لوح المحفوظ) هەیە جا ئەوان خۆیان چۆنیان دەوێت ئاوای بنوسن؟ ئاشکرایە کە ئەوخوا نە ناسانە هیچکام لەمانەیان نیە، هەر سەرلێشێواو و لوت بەرزو خۆنەناسن بۆیە خوایش ڕێنماییان ناکات.

(٤٨) جا تۆ خۆت بگرە لەسەر ئەو ئێشو ئازارو تانەو تەشەرو سزادانەی یارەکانت لە بەر فەرمانی پەروەردگارت وەکو خاوەنی ماسیەکە (یونس) مەبە ، کە خۆی نەگرت دەرچو بەر لەوەی فەرمانی خوای بۆ بێت ، جا کەوتە ناو دەریاو ماسی قوتی داو لەناو سکیدا دڵ پڕلە غەمو پەژارەبو ئەو کاتەی کە بانگی کردە پەروەردگاریو دانی بە هەڵەی خۆی دا نا وەك لە سورەتی (الصافات)دا باسکرا.

(٤٩) ئەگەر چاکەی پەروەردگاری فریای نەکەوتایە لەو چۆڵاییەدا فڕە دەدراو ئەو لە لۆمەکراوان دەبو.

(٥٠) جا خوا هات بەهانایەوەو کردی بە پێغەمبەر بۆ سەر گەلێکی ترو لە ڕیزی پیاوچاکاندا داینا.

(٥١) خۆ نزیکبو خوانەناسان هەر بە چاویان هەڵت دێرن کاتێك کە قورئانیان بیست. بەڕاستی چاوکاریگەری خۆی هەیە لەسەر خەڵك هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی:{العَینُ حَقٌّ/ چاو ڕاستەو کاریگەری هەیە لە مرۆڤدا بەئیزنی خوا}.

(٥٢) جا ئەوەی کە تۆ دەیخوێنیتەوە بەسەریاندا هەر قورئانێکە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوەیە نە محمد ﷺ جادوگەرو شێتە نە قورئانیش جادوە، بەڵکوفەرمودەی خودایەو کەموکوڕی تێدانیە جاسەرلێشێواو دڵنخۆشان هەرچی دەڵێن بابڵێن ڕاستی بە درۆ ناگۆڕێ، ولله الحمد.

## (٦٩) سورەتی حاقە (٥٢)

سورەتی حاقە کە سورەتی شەستونۆهەمی قورئانە کە بەکۆی دەنگ لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، پەنجاو دوو ئایەتە. لە سەرەتای ئەم سورەتەدا وشەی(ٱلۡحَآقَّةُ) هاتووە هەر بەم ناوەش ناسراوە ئەم وشەیە لە قورئاندا تەنها لەم سورەتەدا هاتوە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین حەفتاوحەوتەمین سورەتە کە پێش سورەتی ( المعارج ) و پاش سورەتی (تبارك)دابەزی وە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەوەی کەراستەو دێتەدی.

(٢) کامەیە ئەوەی کە دێتە دی؟

(٣) تۆ نازانی ئەوەی کە دێتەدی چۆنەو چ کارەساتێکی گەورە ڕودەدات کەهاتنی قیامەتە بەهەمو ڕوداوەکانیەوە؟ پاشان خوا باسی ئەو گەلانە دەکات کە باوەڕیان بەو قیامەتە نەبوەو دەفەرموێ:

(٤) گەلی سەمودو عاد باوەڕیان نەبو بە قیامەت کە بە (القَارِعَة/ کوتێنەر) ناوبراوە، چونکە بە توندی دڵەکان دەکوتێت.

(٥) ئەوسا سەمود کەگەلی صالح پێغەمبەرە ؑ بەهۆی سەرکەشیانەوە لەناوبران.

(٦) بەڵام عادی گەلی هود پێغەمبەر ؑ بەهۆی بایەکی ساردی توندەوە لەناوبران . پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {نُصِرْتُ بِالصَّبَا وَأُهْلِكَتْ عَادٌ بِالدَّبُورِ/متفق عليه/ من بە بای بەیانی یارمەتی درامو عادیش بە بای شەماڵ لەناوبران}

وَجَآءَ فِرۡعَوۡنُ وَمَن قَبۡلَهُۥ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتُ بِٱلۡخَاطِئَةِ ﴿٩﴾ فَعَصَوۡاْ رَسُولَ رَبِّهِمۡ فَأَخَذَهُمۡ أَخۡذَةٗ رَّابِيَةً ﴿١٠﴾ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ نَفۡخَةٞ وَٰحِدَةٞ ﴿١٣﴾ وَحُمِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ وَٱلۡجِبَالُ فَدُكَّتَا دَكَّةٗ وَٰحِدَةٗ ﴿١٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ﴿١٥﴾ وَٱنشَقَّتِ ٱلسَّمَآءُ فَهِيَ يَوۡمَئِذٖ وَاهِيَةٞ ﴿١٦﴾ وَٱلۡمَلَكُ عَلَىٰٓ أَرۡجَآئِهَاۚ وَيَحۡمِلُ عَرۡشَ رَبِّكَ فَوۡقَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ ثَمَٰنِيَةٞ ﴿١٧﴾ يَوۡمَئِذٖ تُعۡرَضُونَ لَا تَخۡفَىٰ مِنكُمۡ خَافِيَةٞ ﴿١٨﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقۡرَءُواْ كِتَٰبِيَهۡ ﴿١٩﴾ إِنِّي ظَنَنتُ أَنِّي مُلَٰقٍ حِسَابِيَهۡ ﴿٢٠﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ ﴿٢١﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿٢٢﴾ قُطُوفُهَا دَانِيَةٞ ﴿٢٣﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَآ أَسۡلَفۡتُمۡ فِي ٱلۡأَيَّامِ ٱلۡخَالِيَةِ ﴿٢٤﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِشِمَالِهِۦ فَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُوتَ كِتَٰبِيَهۡ ﴿٢٥﴾ وَلَمۡ أَدۡرِ مَا حِسَابِيَهۡ ﴿٢٦﴾ يَٰلَيۡتَهَا كَانَتِ ٱلۡقَاضِيَةَ ﴿٢٧﴾ مَآ أَغۡنَىٰ عَنِّي مَالِيَهۡۜ ﴿٢٨﴾ هَلَكَ عَنِّي سُلۡطَٰنِيَهۡ ﴿٢٩﴾ خُذُوهُ فَغُلُّوهُ ﴿٣٠﴾ ثُمَّ ٱلۡجَحِيمَ صَلُّوهُ ﴿٣١﴾ ثُمَّ فِي سِلۡسِلَةٖ ذَرۡعُهَا سَبۡعُونَ ذِرَاعٗا فَٱسۡلُكُوهُ ﴿٣٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ لَا يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٣٣﴾ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ﴿٣٤﴾

﴿٧﴾ کە حەوت شەو و هەشت ڕۆژ بەبێ پسانەوە زاڵی کرد بەسەریاندا، جا تۆ ئەو گەلە دەبینیت کە لە جێگای خۆیاندا چەنوملّ کەوتون هەروەکو دار خورمای ناو قرۆڵ.

﴿٨﴾ جا ئایا تۆ کەسێك دەبینیت لەوان کە مابێتەوە؟ نەخێر.

﴿٩﴾ فیرعەونو ئەوانەی پێش ئەویشو خەڵکی شارە سەروبنکراوەکانیش تاوانیان کرد.

﴿١٠﴾ جا نافەرمانی پێغەمبەری پەروەردگاری خۆیانیان کرد ئەوسا خۆ تۆڵەی لێ کردنەوە بە تۆڵەکردنەوەیەکی سەختو دەردناك.

﴿١١﴾ کاتێك کەئاو ئەوەندە زۆربو لە بگاردا نەما ئێمە ئێوەمان لەو کەشتیە گەورەدا هەڵگرت، مەبەست باپیرانی ئێمەیەو کەشتی نوح پێغەمبەرە‌عليه السلام.

﴿١٢﴾ تا بۆ ئێوە ببێت بە وانەیەكو لەو گوێچکانەی کە هەستیارن بزرنگێتەوەوخۆیان لەورەوشتە ناپەسەندەی ئەوان بپارێزن.

﴿١٣﴾ ئەوسا هەر کاتێك یەکجار فووکرا بە کەڵەشاخداو سەرەتای کارەسات دەستی پێکرد.

﴿١٤﴾ جا ئەم زەویەو چیاکان هەڵگیرانو ئەوسا بەیکجارووردو ڕێزاڵ کرانو هەمویان تەپێنران بەسەریەکدا.

﴿١٥﴾ جا ڕوداوەکە لەو ڕۆژەدا ڕودەدات بەڵێ بەراستی کارەساتە چ کارەساتێك، زەوی وەکو چەرم ڕادەکێشرێتو چیاکان وردو ڕێزاڵ دەبن.

﴿١٦﴾ جا ئاسمانیش لەت دەبێت ، ئەوسا ئەو ئاسمانە بتەو و محکەمە لەو ڕۆژەدا لاوازو فشۆڵ دەبێت.

﴿١٧﴾ جا فریشتەکان لە هەمو لایەکی ئەو ئاسمانەوەنو تەختی پەروەردگارت لەسەر ئەوانەیەو هەشت فریشتە یان هەشت بەش لەو ڕۆژەدا هەڵیانگرتوە. لەپێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە کەفەرمویەتی: { أُذِنَ لِي أَنْ أُحَدِّث عَنْ مَلَكٍ مِنْ مَلَائِكَةِ اللَّهِ مِنْ حَمَلَةِ الْعَرْشِ إِنَّ مَا بَيْنَ شَحْمَةِ أُذُنِهِ إِلَى عَاتِقِهِ مَسِيرَةُ سَبْعِ مِائَةِ عَامٍ/ ابوداود، صححه الألباني/ ماوەم پێدراوە کە باسی فریشتەیەك لەفریشتەکان لەوانەی کەهەڵگری عەرشن بکەم کە بەراستی لەنێوان نەرمە گوێی هەتا شانی حەو سەد ساڵ ڕێگایە} .

﴿١٨﴾ ئەو ڕۆژە ئێوە دێننە مەیدانەوەو ڕادەنوێنرێن بۆ حیسابو هیچ شتێکی شاراوەی ئێوە ناشاردرێتەوەو هەموی ئاشکرا دەبێت. جا کارەسات هەیە لەو کارەساتە گەورەو سەختو شەرمەزاری هێنەرە گەورەتر بێت؟

﴿١٩﴾ ئەوسا ئەو کەسەی کە بەدەستی ڕاستی نامەی کردارەکانی پێبدرێت جالەخۆشیاندا هاوار دەکاتو دەڵێت: بگرنو بیخوێننەوە نامەی کرارەکانم.

﴿٢٠﴾ بێگومان من دڵنیابوم کە دەگەم بە حیسابی خۆم بۆیە باش خۆم بۆ ماندو کرد.

﴿٢١﴾ جا خوایش دەفەرموێ: جا ئەو کەسە لەناو ژیانێکدایە کە ژیانێکی خۆشو هیچ ناخۆشیەکی تێدانیە بۆی .

﴿٢٢﴾ لەناو باخچەیەکدایە کە جێگاو کۆشكو درەختانی هەمویان بەرزن.

﴿٢٣﴾ کە هێشوی میوەی ئەو باخچەیە هەرچەند بەرزیش بێت نزیك دەبێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

﴿٢٤﴾ جا پێیان دەوترێت بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێت بەهۆی ئەو ئیشە باشانەی کە دەستپێشخەریتان کردبو بۆی لەو زەمانەی دنیادا کە ڕۆیشت. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: { إِنَّ اللَّهَ يُدْنِي الْمُؤْمِنَ فَيَضَعُ عَلَيْهِ كَنَفَهُ وَيَسْتُرُهُ فَيَقُولُ أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا أَتَعْرِفُ ذَنْبَ كَذَا

فَلَيْسَ لَهُ ٱلْيَوْمَ هَٰهُنَا حَمِيمٌ ﴿٣٥﴾ وَلَا طَعَامٌ إِلَّا مِنْ غِسْلِينٍ ﴿٣٦﴾ لَّا يَأْكُلُهُۥٓ إِلَّا ٱلْخَٰطِـُٔونَ ﴿٣٧﴾ فَلَآ أُقْسِمُ بِمَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٨﴾ وَمَا لَا تُبْصِرُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿٤٠﴾ وَمَا هُوَ بِقَوْلِ شَاعِرٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تُؤْمِنُونَ ﴿٤١﴾ وَلَا بِقَوْلِ كَاهِنٍ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ تَنزِيلٌ مِّن رَّبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٣﴾ وَلَوْ تَقَوَّلَ عَلَيْنَا بَعْضَ ٱلْأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذْنَا مِنْهُ بِٱلْيَمِينِ ﴿٤٥﴾ ثُمَّ لَقَطَعْنَا مِنْهُ ٱلْوَتِينَ ﴿٤٦﴾ فَمَا مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ عَنْهُ حَٰجِزِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِنَّهُۥ لَتَذْكِرَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ وَإِنَّا لَنَعْلَمُ أَنَّ مِنكُم مُّكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَسْرَةٌ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٥٠﴾ وَإِنَّهُۥ لَحَقُّ ٱلْيَقِينِ ﴿٥١﴾ فَسَبِّحْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلْعَظِيمِ ﴿٥٢﴾

## سُورَةُ المَعَارِجِ ٧٠ — ٤٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سَأَلَ سَآئِلٌۢ بِعَذَابٍ وَاقِعٍ ﴿١﴾ لِّلْكَٰفِرِينَ لَيْسَ لَهُۥ دَافِعٌ ﴿٢﴾ مِّنَ ٱللَّهِ ذِى ٱلْمَعَارِجِ ﴿٣﴾ تَعْرُجُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ إِلَيْهِ فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُۥ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ ﴿٤﴾ فَٱصْبِرْ صَبْرًا جَمِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّهُمْ يَرَوْنَهُۥ بَعِيدًا ﴿٦﴾ وَنَرَىٰهُ قَرِيبًا ﴿٧﴾ يَوْمَ تَكُونُ ٱلسَّمَآءُ كَٱلْمُهْلِ ﴿٨﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ﴿٩﴾ وَلَا يَسْـَٔلُ حَمِيمٌ حَمِيمًا ﴿١٠﴾

فَيَقُولُ نَعَمْ أَيْ رَبِّ حَتَّى إِذَا قَرَّرَهُ بِذُنُوبِهِ وَرَأَى فِي نَفْسِهِ أَنَّهُ هَلَكَ قَالَ سَتَرْتُهَا عَلَيْكَ فِي الدُّنْيَا وَأَنَا أَغْفِرُهَا لَكَ الْيَوْمَ فَيُعْطَى كِتَابَ حَسَنَاتِهِ وَأَمَّا الْكَافِرُ وَالْمُنَافِقُونَ فَيَقُولُ الْأَشْهَادُ هَؤُلَاءِ الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى رَبِّهِمْ أَلَا لَعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ/ البخاري/ بێگومان كە ﷻ لەباوەڕدارەوە نزیك دەبێتەوە ئینجا باڵی دەخێتە سەریو دایدەپۆشێت ئەوسا دەفەرموێ: ئایا فلان گوناهت دەزانی؟ ئایا فلان گوناهت دەزانی؟جا یەژێ: بەڵێ ئەی پەروەردگارم، هەتاوای لێدەكات كە دان بە گوناهی خۆیدا بنێت، ئیتر پێی وایە تازە لەناوچوە، ﷲدەفەرموێ: لەدنیادا بۆم شاردیتەوەو ئەمڕۆش لێت خۆش دەبم جا نامەی چاكە كانی پێدەدرێت بەڵام بۆ خوا نەناسو دوورو ئەوسا شایەتەكان لە بارەیانەوە دەڵێن: ئا ئەوانە درۆیان بەدەم پەروەردگاری خۆیانەوە كردوە، هۆخەڵكینە ئاگاداربن، لەعنەتی خوا لەستەمكاران}.

﴿٢٥﴾ جا ئەو كەسەی كە نامەی كردارەكانی بە دەستی چەپی پێبدەردێت (ئەوەندە شەرمەندە دەبێتو سزای دیارە لە بەرچاو) دەڵێت: خۆزگە نامەی كردارم پێنەدرایە.

﴿٢٦﴾ وەحیسابی خۆمم هەر نەزانیبایە.

﴿٢٧﴾ خۆزگە ئەم مردنەم بۆ هەمیشە بووایەو زیندو نەبوومایەوە.

﴿٢٨﴾ ماڵەكەم هیچ سوودی پێنەدام.

﴿٢٩﴾ دەسەڵاتو هێزم لەناوچوو. ئینجا خوا بە فریشتەی بەرپرس دەفەرموێ:

﴿٣٠﴾ بیگرن، ئەوسا زنجیری لەملكەن.

﴿٣١﴾ پاشان بیخەنە ناو دۆزەخەوە.

﴿٣٢﴾ پاشان لەناو پێونێكی حەفتا گەزیدا پێونی بكەن، ئەوسا بەرەودۆزەخ پەلكێشیانكەن.

﴿٣٣﴾بێگومان ئەو باوەڕی بەو خوا گەورە نەبوە.

﴿٣٤﴾ خۆخەڵكیشی هەڵنەناوە لەسەر خواردن بە كەمدەستان.

﴿٣٥﴾ئەوسا لەمرۆژەو لەم شوێنەدا دۆستێكی دڵسۆزی نیە.

﴿٣٦﴾ خۆ جگە لە خوێنو كێمی بۆگەنیوی دۆزەخیان هیچ خوراكنێكی تری نیە.

﴿٣٧﴾كە جگە لە تاوانباران كەس ئەوخواردنەوە ناخواتەوە.

﴿٣٨﴾سوێند بەو هەمو نیشانەو بەڵگە گرنگانەی كە دەیبینن.

﴿٣٩﴾ وە سوێند بەوەیش كە نایبینن.

﴿٤٠﴾بێگومان كە ئەوقورئانە قسەی نێرراوێكی بەڕێزەو لە پەروەردگاریەوە پێی گەیشتوە.

﴿٤١﴾ جا ئەوە نە قسەی شاعیرە، كەم باوەڕ دەهێنن.

﴿٤٢﴾ وە نە قسەی فاڵچیشە، كەم بیر دەكەنەوە.

﴿٤٣﴾بەڵكو ئەم قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە ڕەوانە كراوە.

﴿٤٤﴾ئەگەر هەندێ قسەی بەدەم ئێمەوە بكردایە.

﴿٤٥﴾بێگومان زۆر بەتوندی دەمانگرت.

﴿٤٦﴾ پاشان ڕەگی دڵمان دەبچڕی ودەمانكوشت. واتە نابێت باوەڕدار هیچ گومانێكی هەبێت لە ڕاستیو دروستیو یەك سەرچاوەیی ئەم قورئانەداو هیچ كەسێك جگە لە ﷲ لەم پەیامەدا جگە لە گەیاندنی بە دروستی هیچی تری بەدەست نیە،

چونکە هەر کەسێك خۆی لەم پەیامەدا تێهەڵقورتێنێت خودا تۆڵەی لێدەکاتەوەو بە درۆیشی دەخاتەوە.

(٤٧) ئەوسا هیچکام لەئێوەیش ناتوانێ رێی لێ بگرێت.

(٤٨) جا بێگومان ئەو قورئانە پەندو ئامۆژگاریو بیرهێنەرەوەیە بۆ پارێزکاران (قورئان بۆ هەمو کەس وایە ، بەلاَم هەر ئەوان سودی لێ وەردەگرن بۆیە هەندێ جار دەفەرموێ، بۆ پارێزکاران، بۆ باوەڕداران).

(٤٩) خۆ بێگومان ئێمە دەزانین کە لەناو ئێوەدایە کەسانێك کە باوەڕ بەم قورئانە ناکەن. واتە چاك بزانن کە ئێمە شتمان لێ ناشاردرێتەوە و بێ ئاگای نین لەهەڵسوکەوتتان.

(٥٠) جا بێگومان کە ئەو قورئانە داخو خەمێکە بۆ خوانەناسان. چونکە لە قیامەتدا پەشیمان دەبنەوە بەلاَم بێ سودە.

(٥١) سا بێگومان کە ئەو قورئانە ڕاستیەکی وایە کە هیچ گومانی تێدانیە، جا خوانەناسان پێیان خۆش بێت یان پێیان ناخۆشبێت راستی هەر ئەوەیە.

(٥٢) دەسا تۆش پاکیو بێگەردی بۆ ناوی پەروەردگاری گەورەی خۆت بلێو لە تەسبیحاتی بێ ئاگا مەبە، بلێ : بێگەردە ئەو پەروەردگارە گەورەیەی کە ئەم قورئانە گەورەو بەرێزەی ڕەوانە کردوە .

## ٧٠ سورەتی مەعاریج ٤٤

سورەتی مەعاریج کە سورەتی حەفتاهەمی قورئانە ، بەکۆی دەنگ لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، چلو چوار ئایەتە، سورەتی ﴿سَأَلَ سَآئِلٌ﴾ یشی پێ دەوترێت. حەفتاو هەشتەمین سورەتە بەگوێرەی دابەزینو لە پاش سورەتی (الحاقة ) وپێش سورەتی (النبأ ) دابەزیوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) داواکەرێك داوای هاتنی سزای کرد.

(٢) کە ئەو سزایە بە بێگومان ڕودەدات بۆ خوانەناسانو هیچ کەسێکیش ناتوانێت ڕێگای هاتنی بگرێت.

(٣) چونکە ئەو سزایە لەلایەن خوای خاوەنی پلەکانەوەیە.

(٤) فریشتەکانو جبرەئیل یان گیانی باوەڕداران بەرز دەکەنەوە

يُبَصَّرُونَهُمْ يَوَدُّ الْمُجْرِمُ لَوْ يَفْتَدِي مِنْ عَذَابِ يَوْمِئِذٍ بِبَنِيهِ (١١) وَصَاحِبَتِهِ وَأَخِيهِ (١٢) وَفَصِيلَتِهِ الَّتِي تُؤْوِيهِ (١٣) وَمَنْ فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ثُمَّ يُنْجِيهِ (١٤) كَلَّا إِنَّهَا لَظَىٰ (١٥) نَزَّاعَةً لِلشَّوَىٰ (١٦) تَدْعُو مَنْ أَدْبَرَ وَتَوَلَّىٰ (١٧) وَجَمَعَ فَأَوْعَىٰ (١٨) إِنَّ الْإِنْسَانَ خُلِقَ هَلُوعًا (١٩) إِذَا مَسَّهُ الشَّرُّ جَزُوعًا (٢٠) وَإِذَا مَسَّهُ الْخَيْرُ مَنُوعًا (٢١) إِلَّا الْمُصَلِّينَ (٢٢) الَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَائِمُونَ (٢٣) وَالَّذِينَ فِي أَمْوَالِهِمْ حَقٌّ مَعْلُومٌ (٢٤) لِلسَّائِلِ وَالْمَحْرُومِ (٢٥) وَالَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوْمِ الدِّينِ (٢٦) وَالَّذِينَ هُمْ مِنْ عَذَابِ رَبِّهِمْ مُشْفِقُونَ (٢٧) إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمْ غَيْرُ مَأْمُونٍ (٢٨) وَالَّذِينَ هُمْ لِفُرُوجِهِمْ حَافِظُونَ (٢٩) إِلَّا عَلَىٰ أَزْوَاجِهِمْ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُمْ فَإِنَّهُمْ غَيْرُ مَلُومِينَ (٣٠) فَمَنِ ابْتَغَىٰ وَرَاءَ ذَٰلِكَ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْعَادُونَ (٣١) وَالَّذِينَ هُمْ لِأَمَانَاتِهِمْ وَعَهْدِهِمْ رَاعُونَ (٣٢) وَالَّذِينَ هُمْ بِشَهَادَاتِهِمْ قَائِمُونَ (٣٣) وَالَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ يُحَافِظُونَ (٣٤) أُولَٰئِكَ فِي جَنَّاتٍ مُكْرَمُونَ (٣٥) فَمَالِ الَّذِينَ كَفَرُوا قِبَلَكَ مُهْطِعِينَ (٣٦) عَنِ الْيَمِينِ وَعَنِ الشِّمَالِ عِزِينَ (٣٧) أَيَطْمَعُ كُلُّ امْرِئٍ مِنْهُمْ أَنْ يُدْخَلَ جَنَّةَ نَعِيمٍ (٣٨) كَلَّا إِنَّا خَلَقْنَاهُمْ مِمَّا يَعْلَمُونَ (٣٩)

بۆلای ئەو جێگایەی کە فەرمانیان پێدا دەدرێت لە ڕۆژێکدا کە بە ئەندازەی پەنجا هەزار ساڵە.

(٥) جا تۆ خۆت بگرە لەسەر بانگەوازو ئێشو ئازاری دین دژمنان بە خۆگرتنێکی جوان.

(٦) بێگومان ئەوان ئەو سزایە بە دوور دەزانن.

(٧) خۆ ئێمە بە نزیکی دەبینین.

(٨) ڕۆژی هاتنی ئەوسزایە ئەو ڕۆژەکە ئاسمان وەکو زیوی تواوەی لێدێت.

(٩) جا چیاکان وەکو خوری شیکراوەی ڕەنگاو ڕەنگی لێدێت، فشۆڵو سوکنو با بەملاوبەو لادا دەیانفڕێنێ. جا ئەو کاتە ئەوەندە سەختە کەس نایپەرژێتە سەر کەس وەك دەفەرموێ:

(١٠) هیچ دۆستێکی نزیك هەواڵی خزمو دۆستێکی نزیکی خۆی ناپرسێت.

(١١) بە یەکتر پیشان دەدرێن، تاوانبار ئاواتە خوازە بۆئەوەی لە سزای ئەو ڕۆژە خۆی ڕزگاری بێت لەجیاتی خۆی کورەکانی،

(١٢) وە ژنەکەیو براکەی.

(١٣) وە ئەو بەشەی لە تیرەکەی کە ئەویان پەنادەدا.

(١٤) وه ئەوەی لەسەر زەویدایە هەر هەمووی بدات پاشان ئەو ڕزگار بێت، اَللّٰه دەفەرموێ:

(١٥) هەرگیز شتی وا نابێتو كەس لە بارمتەی كەسدا وەرناگیرێت، بێگومان ئەمە بڵێسەی ئاگرە.

(١٦) كە پێستی سەرو هەمو ئەندامەكانی لەشی دادەڕنێ (بەڵام خوا نایكوژێت بەڵكودیسان بۆی چاك دەكاتەوەو هەر بەو شێوەیە سزا دەدرێت).

(١٧) ئەو ئاگرە بانگ دەكاتە ئەو كەسانە كە لە ترسا پشتیان تێكردووەو لێی نزیك نابنەوە (هەروەكو چۆن لە دنیادا پشتیان لە ئایین دەكرد).

(١٨) ئەو كەسەی كە هەر سەروەتو سامانی كۆ دەكردەوەو لەناو كیسەدا دایدەناو مافی مافدارانی لێ نەدەدا. پێغەمبەر ﷺ بە ئەسمای كچی ئەبوبەكری فەرمو: { أَنْفِقِي وَلَا تُحْصِي فَيُحْصِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ وَلَا تُوعِي فَيُوعِيَ اللَّهُ عَلَيْكِ /متفق عليه/ ببەخشەو مەی ژمێرە ، ئەوسا خواش لەسەر تۆ دەی ژمێرێتو مەیخەرە كیسەوە خوالێت دەخاتە كیسەوە}

(١٩) بێگومان كە مرۆڤ بە هەلوعی دروستكراوە، ئینجا مانای هەلوعمان بۆ دەكاتو دەفەرموێت:

(٢٠) (هەلوع ئەو كەسەیە) كە هەر كاتێك هەستی ناخۆشی یان زیان بكات زۆر بێ تاقەتەو خۆی ناگرێت هەر ئاخو داخیەتی.

(٢١) جا هەر كاتێكیش كە ماڵی دەستكەوێت نایبەخشێتو ماڵ پەرستە.

(٢٢) بێجگە لەوانەی كە نوێژخوێنن،

(٢٣) ئەوانەی بە هەمیشەیی لەسەر نوێژەكانیان سوورنو نایفەوتێنن.

(٢٤) وە بێجگە لەو كەسانەی كە لەناو سەروەتو سامانیاندا بەشێكی دیاری هەیە.

(٢٥) بۆ خەڵكانی داواكارو بێ بەش.

(٢٦) وە بێجگە لەو كەسانەی كە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت هەیە

(٢٧) وە جگە لەو كەسانەی كە لە سزای پەروەردگاری خۆیان دەترسنو خۆیان لە خراپەو تاوان دەپارێن.

(٢٨) بێگومان سزای پەروەردگاریان بۆ ئەوە نابێت كە لێی دڵنیابن كە دانابەزێت واتە: مرۆڤی باوەڕدار لەسزای خوا بێترس نیە.

(٢٩) وە بێجگە لەو كەسانەی كە پارێزگاری شەرمگای خۆیان دەكەن لەكاری شورەیی.

(٣٠) تەنها لەگەل هاوسەری خۆیاندا یان لەگەڵ ئەوكەنیزانەدا كەموڵكیانن واتە: لەبارەی ئەودوو تاقمەوە سەرزەنشت ناكرێن.

(٣١) جا هەر كەسێك لەوانە تێپەڕێت ئەوسا ئەوانە دەستدرێژیكەرنو سزایان بۆ هەیە.

(٣٢) وە بێجگە لەو كەسانەی كە ئەمانەتەكانیانو پەیمانەكانیان دەپارێزنو خیانەت لەو دوو شتەدا ناكەن.

(٣٣) وە بێجگە لەو كەسانەی كە شایەتی ڕاستەقینە دەدەنو نایشارنەوەو ڕاستی چۆن بێت وا دەڵێن.

(٣٤) وە بێجگە لەو كەسانەی كە چاودێری نوێژەكانیان دەكەنو لەكاتی دیاری خۆیانداو بە ڕێكوپێكی ئەنجامیان دەدەن، لە سەرەتای ئەم وەسفانەوە بە نوێژ دەستی پێكردو لە كۆتاییەكانیەوە دووبارە گەڕاوەتەوە سەر نوێژ كە بەڵگەی گەورەیو بەنرخیو پڕ خێرو بەرەكەتی نوێژە بۆ بەندەكانی خودا، كە پەیوەندی بەندەیە بە خودای خۆیو جێگای ڕازو نیازیەتی لەگەڵ پەروەردگاری جیهانیانداو هۆی ئارامی دڵو لەشی مرۆڤی خواناسی ڕاستەقینەیەو كۆڵەكەی ئایینەو هەر كەس نوێژ نەكات ئایینی ڕوخاندوە، جا دەبێت چاوەڕوانی سزایەكی چۆن بكات بۆ خۆی، بەڵێ ئەم دە وەسفە لێرەدا هاتون هەر كەسێك بیانپارێزێت ئەوە باوەڕدارێكی ڕاستەقینەیەو بەهەشت بۆ ئەوە.

(٣٥) ئەوانە لەناو باخچەكاندان كە ڕێز لێگیراونو بە چەندین جۆر لە خۆشیو لەزەت و كەیف و سەیراندان. دەسا بەخششی خودای گەورەو میهرەبان، عافیەت بێت لێتان ئەی خاوەن باوەڕان.

(٣٦) ئینجا ئەوە چیەو چییان دەست دەكەوێت ئەو خوانەناسانە كە بەپەلە دێن بۆ لاتو مل هەڵدەبڕنو بۆت دەڕوانن بە گاڵتەكردنەوە.

(٣٧) ئەوسا دەستە دەستە لەلای ڕاستو لەلای چەپەوە بڵاوەی لێدەكەنو دەڵێن: ئەو پیاوە چی وت؟

(٣٨) ئایا هەمو كەسێك لەوان بەتەمایە كە بخرێتە ناو باخچەی نازو نیعمەتەوە لەگەل ئەو هەڵوێستە چەپەڵو چەواشەكاریانەی كە سەبارەت بە پێغەمبەر ﷺ و ئایینی ئیسلام دەیكەن؟

(٣٩) نەخێر شتی وانیە، بێگومان ئێمە ئەوانمان لەو شتە دروستكردوە كە خۆیان دەزانن كە شەهوەتی پیاوەو شتێكی كەمو قێزەونە، جا ئەو لەشە ئەگەر بە بەندایەتی پاك نەبێتەوە بێگومان ناچێتە ناو بەهەشتەوە ، چونكە بەهەشت جێگای پاكانە، جا ئەی مرۆڤی تاوانبارو بیروڕا خراپ تا نەمردوی كاتی ئەوەت هەیە بیربكەیتەوەو بەرەو پەروەردگاری خۆت بگەڕێیتەوە، پەروەردگارت بەسۆزو میهرەبانە ئەم هەلە لە دەست خۆت مەدەو فریوی جێگاو سەروەتو سامانو تەندروستیو شەیتانو ئارەزۆەكانی خۆت نەخۆیت، هەمویان لە دەستت دەردەچێتو لێت جیا دەبنەوە، ئینجا اللَّهُ دەفەرموێ:

(٤٠) سوێند بە پەروەردگاری ڕۆژهەڵاتەكانو ڕۆژئاواكان (هی مانگو خۆرو ئەستێرەكان) بێگومان كە ئێمە دەتوانین،

(٤١) كە ئێوە لەناو ببەینو چاكتر لە ئێوە دروست بكەینو ڕێگامان لێ ناگیرێت.

(٤٢) جا وازیان لێ بهێنە با هەر خەریكی شتی پڕوپوچ بنو گەمە بكەن تا بەو ڕۆژەیان دەگەن كە هەڕەشەیان لێكراوە، جا ئەو كاتەیە كە لە خەوی نەزانیو خۆخەڵەتاندن خەبەریان دەبێتەوە، خۆ تازە یەخەیان گیراوەو ڕزگاربونیان نیە.

(٤٣) ئەو ڕۆژەی كە لە قەبرەكانیاندا بەپەلە دێنەدەر هەروەكو ئەوەی بۆ لای شتانێكی دیاری بڕۆن بەپەلە نەوەكو لە دەستیان دەربچێت.

(٤٤) چاو شۆڕن كە دوچاری دەستەپاچەییو سەرشۆڕی بوون ئەوە ئەوڕۆژەیەكە لە دنیادا بەڵێندرابو بەڵام ئەوان باوەڕیان پێی نەبو وا پێی گەیشتن.

## سورەتی نوح عليه السلام ٢٨ ٧١

سورەتی نوح كە سورەتی حەفتاویەكەمی قورئانە ، لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوە، بیستو هەشت ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین حەفتاو سێهەمین سورەتە كە پاش سورەتی( النَّحْل )و پێش سورەتی( الطُّور) دابەزیوە.

لە چلو سێ شوێنی قورئاندا ناوی پێغەمبەر نوح عليه السلام هاتوە كە سێ شوێنیان لەم سورەتەدایە، ئەم سورەتە لە سەرەتادا باس لە پێغەمبەر نوح عليه السلام دەكات، لە دوای ئەوەی كە مرۆڤ هەمویان

فَلَآ أُقۡسِمُ بِرَبِّ ٱلۡمَشَٰرِقِ وَٱلۡمَغَٰرِبِ إِنَّا لَقَٰدِرُونَ ﴿٤٠﴾ عَلَىٰٓ أَن نُّبَدِّلَ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَمَا نَحۡنُ بِمَسۡبُوقِينَ ﴿٤١﴾ فَذَرۡهُمۡ يَخُوضُواْ وَيَلۡعَبُواْ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي يُوعَدُونَ ﴿٤٢﴾ يَوۡمَ يَخۡرُجُونَ مِنَ ٱلۡأَجۡدَاثِ سِرَاعٗا كَأَنَّهُمۡ إِلَىٰ نُصُبٖ يُوفِضُونَ ﴿٤٣﴾ خَٰشِعَةً أَبۡصَٰرُهُمۡ تَرۡهَقُهُمۡ ذِلَّةٞۚ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمُ ٱلَّذِي كَانُواْ يُوعَدُونَ ﴿٤٤﴾

## سُورَةُ نُوحٍ ٧١ ٢٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦٓ أَنۡ أَنذِرۡ قَوۡمَكَ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿١﴾ قَالَ يَٰقَوۡمِ إِنِّي لَكُمۡ نَذِيرٞ مُّبِينٌ ﴿٢﴾ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغۡفِرۡ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرۡكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوۡ كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ﴿٥﴾ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا ﴿٦﴾ وَإِنِّي كُلَّمَا دَعَوۡتُهُمۡ لِتَغۡفِرَ لَهُمۡ جَعَلُوٓاْ أَصَٰبِعَهُمۡ فِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَٱسۡتَغۡشَوۡاْ ثِيَابَهُمۡ وَأَصَرُّواْ وَٱسۡتَكۡبَرُواْ ٱسۡتِكۡبَارٗا ﴿٧﴾ ثُمَّ إِنِّي دَعَوۡتُهُمۡ جِهَارٗا ﴿٨﴾ ثُمَّ إِنِّيٓ أَعۡلَنتُ لَهُمۡ وَأَسۡرَرۡتُ لَهُمۡ إِسۡرَارٗا ﴿٩﴾ فَقُلۡتُ ٱسۡتَغۡفِرُواْ رَبَّكُمۡ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارٗا ﴿١٠﴾

خواپەرست بونو لەسەر بیروبۆچونی ئادەم ، پاش تێپەڕبونی چەندین سەدە خەڵك كەم كەم روی لە لادانو شیرك كرد جا ئەو كاتە پەروەردگار یەكەم نێرراوی خۆی رەوانەكرد بۆ مرۆڤ كە نوح عليه السلام بو كە وتراوە كوڕی "لامك بن متوشلخ بن أخنوخ كە إدریسی بن یرد بن مهلایل بن أنوش بن قینان بن شیس بن ئادەم"ـە .

ئیبنوعەباس دەڵێت: { كانَ بَيْنَ نوح وَ آدم عشرة قرون كُلّهُم على شَريعة من الحق فاختلفوا فَبَعَثَ اللهُ النبيينَ مُبشرينَ ومُنذرين/مستدرك الحاكم، صححه الالباني/ نێوان ئادەمو نوح(سەلامی خوایان لێبێ) دەسەدە بوەو هەمویان لەسەر ڕێبازێكی ڕاست بون، جا لەیەك ترازان ئەوسا خوا پێغەمبەرانی رەوانە كرد كە مژدە دەرو ترسێنەر بن}

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بێگومان ئێمە نوحمان نارد بۆ لای گەلەكەی كە تەواوی خەڵكی زەوی سەردەمی خۆی بو(پێمان وت:) كە قەومەكەت بترسێنەو بێداریان بكەرەوە پێش ئەوەی ئەو سزا بەژانەیان بۆ بێت.

(٢) وتی: ئەی گەلی خۆم بێگومان من ترسێنەرێكی ئاشكرام بۆ ئێوە.

يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ وَيُمْدِدْكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل
لَّكُمْ جَنَّـٰتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَـٰرًا ﴿١٢﴾ مَّا لَكُمْ لَا تَرْجُونَ لِلَّهِ وَقَارًا ﴿١٣﴾
وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا ﴿١٤﴾ أَلَمْ تَرَوْا۟ كَيْفَ خَلَقَ ٱللَّهُ سَبْعَ سَمَـٰوَٰتٍ
طِبَاقًا ﴿١٥﴾ وَجَعَلَ ٱلْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ ٱلشَّمْسَ سِرَاجًا ﴿١٦﴾
وَٱللَّهُ أَنۢبَتَكُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ نَبَاتًا ﴿١٧﴾ ثُمَّ يُعِيدُكُمْ فِيهَا وَيُخْرِجُكُمْ
إِخْرَاجًا ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ بِسَاطًا ﴿١٩﴾ لِّتَسْلُكُوا۟ مِنْهَا
سُبُلًا فِجَاجًا ﴿٢٠﴾ قَالَ نُوحٌ رَّبِّ إِنَّهُمْ عَصَوْنِى وَٱتَّبَعُوا۟ مَن لَّمْ يَزِدْهُ
مَالُهُۥ وَوَلَدُهُۥٓ إِلَّا خَسَارًا ﴿٢١﴾ وَمَكَرُوا۟ مَكْرًا كُبَّارًا ﴿٢٢﴾ وَقَالُوا۟
لَا تَذَرُنَّ ءَالِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ
وَنَسْرًا ﴿٢٣﴾ وَقَدْ أَضَلُّوا۟ كَثِيرًا ۖ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا ضَلَـٰلًا ﴿٢٤﴾
مِّمَّا خَطِيٓـَٔـٰتِهِمْ أُغْرِقُوا۟ فَأُدْخِلُوا۟ نَارًا فَلَمْ يَجِدُوا۟ لَهُم مِّن دُونِ
ٱللَّهِ أَنصَارًا ﴿٢٥﴾ وَقَالَ نُوحٌ رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى ٱلْأَرْضِ مِنَ ٱلْكَـٰفِرِينَ
دَيَّارًا ﴿٢٦﴾ إِنَّكَ إِن تَذَرْهُمْ يُضِلُّوا۟ عِبَادَكَ وَلَا يَلِدُوٓا۟ إِلَّا فَاجِرًا
كَفَّارًا ﴿٢٧﴾ رَّبِّ ٱغْفِرْ لِى وَلِوَٰلِدَىَّ وَلِمَن دَخَلَ بَيْتِىَ
مُؤْمِنًا وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَلَا تَزِدِ ٱلظَّـٰلِمِينَ إِلَّا تَبَارًۢا ﴿٢٨﴾

﴿٣﴾ کەپێتان دەڵێم: بەندایەتی خودا بکەن‌و لەو بترسن‌و پەیڕەوی من بکەن.

﴿٤﴾ کە لە هەندێ گوناهتان چاوپۆشی دەکات‌و دەتان هێڵێتەوە تا ماوەی دیاریکراو هەر کاتێك ئەو ماوە هات دواناخرێت ، ئای ئەوەتان بزانیایەو لە ئیشی چاك کۆتایتان نەکردایەو لە خراپ دوور بکەوتنایەوە تا سزای ﷲ یەخەی نەگرتون، دیارە ئەم گەلەی نوحیش ﷺ هەروەکو گەلەکانی تر بەگوێی نوحیان ﷺ نەکردوە بۆیە لەلای خوا شکاتی کردون.

﴿٥﴾ وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان من بە شەو و بە ڕۆژ ئەم گەلەی خۆمم بەرەو یەکخواپەرستی‌و ترسان لە خوا بانگکردوە.

﴿٦﴾ بەڵام ئەو بانگەی من بۆیان جگە لە زیاتر دوورکەوتنەوەیان لە یەکخواپەرستی سوودێکی تری نەبوە بۆیان.

﴿٧﴾ جا بێشك هەر کاتێك کە من بانگم کردون بۆ ئەوەی کە تۆ لێیان ببوریت ئەوان پەنجەی خۆیان دەخستە ناو گوێچکەکانیان‌و بە پۆشاکەکانیان سەری خۆیان دادەپۆشی تا نە قسەم ببیستن‌و نە چاویان لێم بێت‌و زیاتر لەسەر خراپەو بت پەرستی سووردەبون‌و خۆیان لە ئاست ڕاستی‌وخواپەرستیدا زۆر بە زلگرت چ خۆزلگرتنێك.

﴿٨﴾ پاشان بە دەنگی بەرزو بە ئاشکرا بانگم کردن، بەڵام ئەویش هەرسودی نەبو.

﴿٩﴾ پاشان هەم ئەم بانگەم بە شێوەی ئاشکراو بە شێوەی زۆر نهێنی پێگەیاندن.

﴿١٠﴾ جا پێم وتن لە پەروەردگارتان داوای لێبوردن بکەن بێگومان ئەو زۆر لێبوردەیە لەسەر ئەو تاوانانەی کە بەندەکانی دەیکەن.

﴿١١﴾ کە ئەو لە ئاسمانەوە ئاوی زۆرتان بۆ ڕەوانەدەکات.

﴿١٢﴾ ئەوسا سامانێکی زۆرو کوڕانتان پێدەدات‌و باخات‌و جۆگەیانی ئاوتان بۆ دابین دەکات، واتە: بە داوای لێبوردن کردن لە خوا، خوا دەرگاکان خێری ئاسمان‌و زەویتان لێدەکاتەوەو لە بەروبومەکانی بەلێشاوی دەخۆنەوەو دەتانکات بە خاوەنی سامان‌و کوڕانی زۆر، ئەمە بەشێوەی جوانکردن‌و تەماع خستنەبەر بانگ کراون، پاشان هەڕەشەیان لێدەکات‌و دەفەرموێ:

﴿١٣﴾ چیە ئەوەی کەئێوەی ئەوەندە نەزانکردوە کە لە گەورەیی‌و دەسەڵاتی خودا ناترسن؟!

﴿١٤﴾ لە حاڵێکدا کە ئێوەی بە چەند قۆناغێك دروستکردوە لە ئاوێکی قێزەون، پارچەیەك خوێنی مەیوو پارچە گۆشتێك‌و ئێسقان‌و داپۆشینی ئێسقان بەگۆشت‌و منداڵی‌و هەرزەکاری‌و پیاوی تەواو پیری‌وپاشان مراندن یان کەنەفتی‌و پاشان هەرمراندن ، بەڵام تۆئەی مرۆڤ لە هیچکام لەم قۆناغانەدا بە هۆش نەیەیتەوەو لەو خودا زاناو دەسەڵاتدارە گەورەیە نەترسیت، دەبێت چاوەڕوانی چۆن پاشەڕۆژێك بۆ خۆت بکەیت؟

﴿١٥﴾ ئایا ئێوە نابینن کە خوا چۆن ئەو حەوت ئاسمانەی لەسەریەك دروستکردوە؟

﴿١٦﴾ ئەوسا مانگی تێدا داناوە بۆ ڕونکردنەوەو خۆریشی کردوە بە چرایەك بۆ ڕۆشنکردنەوەی ئەم بونەوەرە، ئەمانە هەموی بۆ خزمەتکردنی مرۆڤە بەڵام مرۆڤ زۆر سپڵەو نمەك نەناسە.

﴿١٧﴾ خۆ هەر خودایە کە ئێوەی لە زەوی سەوز کرد بە سەوزکردن.

﴿١٨﴾ پاشان دەتانگێڕێتەوە بۆ ناوی‌و دەریشتان دەهێنێتەوە بە دەرهێنان لە ناوی‌و زیندوتان دەکاتەوە بۆ حیساب‌و پاداشت.

﴿١٩﴾ خۆ خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ ڕاخستوون.

﴿٢٠﴾ کە تێیدا هاتوچۆ بکەن بە ڕێگا پان‌و بەرینەکانیدا بە هەمو گۆشەو کەنارەکانیدا. ئەمانە هەموی ئامۆژگاری نوح ﷺ بو بۆ

گەلەکەی، بەڵکو لە خوا بترسن‌و لە بتپەرستی‌و خراپەکاری دەست بکێشنەوە، وە ئەم بانگەوازەی نوح ﷺ نۆسەدو پەنجا ساڵی خایاندوە، بەڵام ئەوان هەر دژایەتیان کردووە نوحیش ﷺ هەموجۆرە شێوازێکی بەکارهێناوە بۆیان، بەڵکو بەیەکێکیان ئەوگەلەی لەسزای خوا رزگار بکات بەڵام ئەوان تا دەهات زیاتر لێی دور دەکەوتنەوە.

﴿٢١﴾نوح ﷺ وتی: ئەی پەروەردگارم بێگومان ئەوانە فەرمانی منیان شکاندوەو پەیڕەوی کەسێك دەکەن کە جگە لە زیان نە ماڵ‌و نە فەرزەندی بۆ زیاد نەکردون.

﴿٢٢﴾ ئەوسا فێڵیان کرد بە فێڵکردنێکی گەورە بە ئازاردانی نوح ﷺو پەیڕەوانی‌و بەدرۆخستنەوەی پەیامەکەی خواو هەڵنانی نەزان‌و نەفامەکان دژی ئەو پێغەمبەرە ﷺ .

﴿٢٣﴾ جا وتیان (بەگوێی مەکەن‌و) واز لە بەندایەتی (وەدو سُواع‌و یەغوس‌و یەعوق‌و نەسر) مەهێنن. ئەمانە پیاوچاکانی ئەو گەلەی لە ئادەمەوە تا نوح بون کاتێك کەمردن شەیتان وای خستە ناو دڵیانەوە کە لە شوێنی کۆڕو کۆبونەوەیاندا وێنەی ئەوانە دروست بکەن بەناو خۆیانەوە، ئەوانیش وایانکرد ، جا ئەوانە نەپەرستران تا ئەو کاتەی کە خەڵکی ئەوسەردەمە مردن‌و خەڵکی سەردەمی پاش ئەوان زانیاری تریان جگە لەوەی ڕێزیان لێبگرن‌و بەرزیان بنرخێنن نەبو، ئەوەبو کەم کەم پەرستنیان‌و بەندایەتییان بۆ ئەو پەیکەرانە دەکرد، بۆیە ئاینی ئیسلام هەر شتێك سەرئەنجامی مرۆڤ بەرەو خراپە ببات هەر لە سەرەتاوە قەدەغەی دەکات وەکو: قەبرو وێنەو هەیکەلی گەورەو پیاوچاکان ، چونکە زۆر نابات ئەوانەدەکرێن بە خواو لەلایەن مرۆڤەوە بەندایەتیان بۆ دەکرێت، چونکە مرۆڤ لەناخی خۆییدا هەست دەکات بەوەی کە شتانێك هەن لە توانای ئەودا نین جا ئەگەر خوای بە چاکی نەناسی ڕوو لە دارو بنچك‌و قەبری پیاوچاك‌و هەیکەل‌و ئەمانە دەکات‌و لێیان دەپاڕێتەوە، کەلە راستیدا ئەوە بەندایەتیەو شیرکەو بت پەرستیەوهەموکردارێکی چاکی مرۆڤ لەناودەبات کە بەداخەوە ئەم سەردەمەی ئێمەش بەتوندی گەڕاوەتەوە بۆ هەمان بت پەرستی‌و قەبری پیاوچاکان بینای گەورەو رازاوەی لەسەر دروست دەکرێت‌ونەفامەکانی ئەم گەلە بەدەوریدا دەخولێنەوەو تەوافی دەکەن‌و ماچی دەکەن‌و داوای شیفاو منداڵی لێدەکەن‌و قوربانی بۆ دەکەن کەئەو کارانە وەسفی ﷲ یە بەو مردوانەی دەدەن‌وماڵی خۆیان وێران دەکەن‌و پیاو چاکانیش گرفتاری لێپرسینەوەی ﷻ ﷲ دەکەن، خۆبەدەقی قورئان خوا پرسیار لەعیسا دەکات، دەی چۆن پرسیار لەوان

٧٢ سُورَةُ الجِنِّ ٢٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلۡ أُوحِيَ إِلَيَّ أَنَّهُ ٱسۡتَمَعَ نَفَرٞ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَقَالُوٓاْ إِنَّا سَمِعۡنَا قُرۡءَانًا عَجَبٗا ﴿١﴾ يَهۡدِيٓ إِلَى ٱلرُّشۡدِ فَـَٔامَنَّا بِهِۦۖ وَلَن نُّشۡرِكَ بِرَبِّنَآ أَحَدٗا ﴿٢﴾ وَأَنَّهُۥ تَعَٰلَىٰ جَدُّ رَبِّنَا مَا ٱتَّخَذَ صَٰحِبَةٗ وَلَا وَلَدٗا ﴿٣﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ يَقُولُ سَفِيهُنَا عَلَى ٱللَّهِ شَطَطٗا ﴿٤﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن تَقُولَ ٱلۡإِنسُ وَٱلۡجِنُّ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿٥﴾ وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٞ مِّنَ ٱلۡإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٖ مِّنَ ٱلۡجِنِّ فَزَادُوهُمۡ رَهَقٗا ﴿٦﴾ وَأَنَّهُمۡ ظَنُّواْ كَمَا ظَنَنتُمۡ أَن لَّن يَبۡعَثَ ٱللَّهُ أَحَدٗا ﴿٧﴾ وَأَنَّا لَمَسۡنَا ٱلسَّمَآءَ فَوَجَدۡنَٰهَا مُلِئَتۡ حَرَسٗا شَدِيدٗا وَشُهُبٗا ﴿٨﴾ وَأَنَّا كُنَّا نَقۡعُدُ مِنۡهَا مَقَٰعِدَ لِلسَّمۡعِۖ فَمَن يَسۡتَمِعِ ٱلۡأٓنَ يَجِدۡ لَهُۥ شِهَابٗا رَّصَدٗا ﴿٩﴾ وَأَنَّا لَا نَدۡرِيٓ أَشَرٌّ أُرِيدَ بِمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ أَرَادَ بِهِمۡ رَبُّهُمۡ رَشَدٗا ﴿١٠﴾ وَأَنَّا مِنَّا ٱلصَّٰلِحُونَ وَمِنَّا دُونَ ذَٰلِكَۖ كُنَّا طَرَآئِقَ قِدَدٗا ﴿١١﴾ وَأَنَّا ظَنَنَّآ أَن لَّن نُّعۡجِزَ ٱللَّهَ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَن نُّعۡجِزَهُۥ هَرَبٗا ﴿١٢﴾ وَأَنَّا لَمَّا سَمِعۡنَا ٱلۡهُدَىٰٓ ءَامَنَّا بِهِۦۖ فَمَن يُؤۡمِنۢ بِرَبِّهِۦ فَلَا يَخَافُ بَخۡسٗا وَلَا رَهَقٗا ﴿١٣﴾

ناکات؟هەی نەزان‌و نەفامەکان بەوکارانەتان نەك هەرخۆتان گرفتار دەکەن بەڵکو گێچەڵ بۆپیاوچاکانیش دروست دەکەن.

﴿٢٤﴾ جا نوح ﷺ لەدرێژەی سکاڵاکەیدا دەڵێت: بە راستی خەڵکێکی زۆریان گومڕا کردوە، دەی تۆیش ئەی پەروەردگار ستەمکاران جگە لە گومڕایی شتێکی زیاتریان پێمەدە.

﴿٢٥﴾هەر لەبەر تاوانەکانیان ئەوان بە ئاو خنکێنران ، ئەوسا خرانە ناو ئاگرەوە، جا بێجگە لە خوا هیچ یارمەتیدەرێکی تریان دەست نەکەوت‌وخوایش بەدەمیانەوە نەهات، لە سورەتی (هود)دا چەند گۆشەیەکی ئەم داستانە بەنرخە بەرونی باسکراوە.

﴿٢٦﴾ جا نوح ﷺ پاش ئەوەی کە لەلایەنی پەروەردگارەوە پێی ڕاگەیەنرا کە ئیتر ئەوگەلەت باوەڕت پێناکەن، وتی: ئەی پەروەردگارم هیچکەس لەم خوانەناسانە لەسەر زەوی دا مەهێڵەرەوەو هەمویان لەناوببە.

﴿٢٧﴾ چونکە بێگومان هەروەکو خۆت بە منت ڕاگەیاندوە ئەگەر وازیان لێ بهێنیت بەندەکانت گومڕا دەکەن‌و بێجگە لە منداڵی خراپەکارو سپڵە کەسی تریان لێ پەیدا نابێت.

﴿٢٨﴾ئەی پەروەردگار لێم خۆشبەو لە دایك‌وباوکیشم‌و لەو باوەڕدارەیش کە لە ناو ماڵی منداییەو لە پیاوان‌و ئافرەتانی باوەڕدار، وە ستەمکارانیش جگە لەوەی کە لەناویان ببەیت هیچشتێکی تریان لەگەڵدا مەکە نە لە دنیاداو نە لە دوارۆژدا.

٧٢ سورەتی جین ٢٨

سورەتی جین کە سورەتی حەفتاو دووهەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، بیستو هەشت ئایەتەو بە سورەتی ﴿قُلْ أُوحِيَ﴾ یش ناو دەبرێت، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی چل هەمەو پاش سورەتی (الأعراف) و پێش (يس) دابەزیوە.

ئیبنوعەبباس دەڵێت: شەیتانەکانی جنۆکە پێش هاتنی پێغەمبەر ﷺسەردەکەوتن بۆ ئاسمان بۆ هەواڵ زانین، جا لە ناکاو رێگایان لێگیراو هاتنەوەو وتیان: شتێکی وامان بینیوە ، ئینجا وتیان: بە هەمو لایەکی دنیادا بگەڕێن بێگومان شتێك ڕویداوە، ئەوسا بڵاوەیان لێکرد، ئەوەی کە بەرەو توهامە ڕویشتن ڕویان کردە لای پێغەمبەر ﷺکە لە (بەتنونەخلە)دا بو بۆ یارەکانی نوێژی بەیانی دەکردو قورئانی دەخوێند وتیان: لەبەر ئەمەیە ڕێگامان لێگیراوە، گەڕانەوەو وتیان: قورئانێکی سەیرمان بیست. جا خوا سورەتی (الجن)ی ناردە خوارەوە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ/ البخاري/ کە لەم سورەتەدا هەندێك لە قسەکانی ئەوانی بۆ باسکردوەو دەفەرموێ:

بەناوی اللَّهِ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی محمد بڵێ: بە من گەیشتوە کە چەند کەسێك لە جنۆکە گوێی لەمن گرتوە (لەکاتی قورئان خوێندنم)دا جا وتویانە بێگومان ئێمە قورئانێکی سەیرمان بیست.

(٢) کە ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێگای ڕاست جا ئێمەیش باوەڕمان پێکردو بە ڕاستمان زانیو ئیتر هەرگیز هیچ کەسێك ناکەین بە هاوبەشی خوا.

(٣) جا بێشك بەرزە دەسەڵاتی پەروەردگارمان، نە ژنی هەیەو نە منداڵو نیازی بە هیچکامیان نیە.

(٤) جا بێگومان نەفامەکانمان لە دژی خودا قسەی پڕوپوچیان دەکرد، کەگوایە خوا پێویستی بە واسیتە هەیەو ژنی هەیەو کوڕی هەیەو کچی هەیەو شتی لەو قەبیلەو قوماشە بێنرخو سوکانەکە ﷻ پاكوبێنیازە لەوبڕیاروقسە پڕوپوچانە.

(٥) خۆ بێگومان ئێمەیش وامان دەزانی کە مرۆڤ و جنۆکە هیچ درۆیەك بەدەم خواوە ناکەن.

(٦) سا بێگومان پیاوانێك لە مرۆڤ بون کە بە پیاوانێك لە جنۆکە پەنایان دەگرت، جا بەم کارەیان زیاتر دژایەتی ئاییینیان دەکردو سەرکەشتر دەبون. دابی عەرەب وابو هەرکات ڕێیان لەشوێنێك دەکەوت بۆئەوەی کە لە زەرەر و زیانی جنوکەکان لە ئەماندا بن دەیانگوت: ئەوە ئێمە خۆمان خستە ئەمانی گەورەی جنوکەکانی ئەم ناوچەیە، تا بەم شێوەیە جنوکەکان ئازاریان نەدەن بەڵام جنوکەکان زۆرتر دە یان ترساندن و زیاتر سەریان لێتێکدەدان، یان دەگونجێت مەبەست ئەوە بێت بەم پەناگرتنەی ئینسانەکان بە جنۆکەکان وای دەکرد کە جنۆکەکان زۆرتر لەخو بایی ببنو گوناهو تاوانی زۆرتر بکەن. کەوابو ئەم ئایەتە ئەمە دەسەلمێنێت کە هەم جنۆکەکان دەتوانن کاریگەریان هەبێت لەسەر مرۆڤ و هەم بە پێچەوانەیشەوە، بەئیزنی خودا.

(٧) جا بێگومان ئەوانیش گومانیان دەکرد هەروەك ئێوە گومانتان هەبو کە هەرگیز خودا هیچ کەسێك ڕەوانە ناکاتو کەس نابێتە پێغەمبەر ، یان پێیان وابو خوا کەس زیندو ناکاتەوە هەروەك ئێوە واتان دەزانی.

(٨) ئەوسا بێگومان ئێمە دەگەیشتینە ئاسمان بۆ وەرگرتنی دەنگوباس، بەڵام هەر زوو بینیمان پاسەوانانێکی بەهێزو بڵۆسکی ئاگرین هەمو ئاسمانیان پڕکردوەو ماوە بۆ گوێگرتنو وەرگرتنی دەنگوباسەکان بە ئێمە نادەن.

(٩) ئەوسا بێگومان ئێمە دادەنیشتین لە ئاسمان لە جێگا دانیشتنەکانی گوێگرتندا جا ئێستا هەر کەسێك گوێ بگرێت بڵۆسکی ئاگری بۆ دێتو ناتوانێت لەو شوێنانەدا دانیشێتو گوێ بگرێت.

(١٠) جا بەڕاستی ئێمە تێ نەگەیشتین ئایا بەم ڕێگری ئێمەیە لەزانینی دەنگوباسی ئاسمان مەبەست خراپەکردنە لەگەڵ خەڵکی زەویدا یان مەبەستی پەروەردگاریان چاکەو خۆشیە بۆیان؟ لەپێش هاتنی پێغەمبەرمان ﷺجنۆکەکان دەیانتوانی لە ئاسمان نزیك ببنەوەو قسە لە فریشتەکان وەرگرنو بیهێننەوە بۆ فاڵچیەکانو ئەوانیش بەو قسانە خەڵکیان فریودەدا ، بەڵام بە هاتنی پێغەمبەرمان ﷺئەو دەرگایە داخرا لە فاڵچیەکانو جنۆکەکان ناتوانن بچنە ئەو جێگایانەوە کە لەپێشدا دەچونو ئیتر لەوێوە شتێکی وایان دەست ناکەوێت، بەم شێوەیە فاڵچیان بازاڕیان بەرەو کەساسیو داڕمان هات، ئەمە خزمەتو خێرێکی گەورەیە کە اللَّهُ لەگەڵ ئومەتی پێغەمبەر ﷺدا کردویەتی.

(١١) جا بێگومان لەناو ئێمەدا پیاوانی چاك هەیە، هەیشیانە وانیە یان باوەڕدارەو چاك نیە یان هەر باوەڕداریش نیە خاوەنی چەندین ڕێگاو ڕێبازی جیا جیاین.

(١٢) جا بێگومان ئێمە یەقینمان بو کە هەرگیز لە دەست اللَّهُ دەرناچینو ناتوانین ڕابکەینو خۆمانی لێ ڕزگار بکەین، هەرچی بکەین لەژێر دەسەڵاتو هێزی خودای زاناو داناین.

وَأَنَّا مِنَّا الْمُسْلِمُونَ وَمِنَّا الْقَاسِطُونَ فَمَنْ أَسْلَمَ فَأُولَٰئِكَ تَحَرَّوْا رَشَدًا ﴿١٤﴾ وَأَمَّا الْقَاسِطُونَ فَكَانُوا لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾ وَأَلَّوِ اسْتَقَامُوا عَلَى الطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَاهُم مَّاءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِنَفْتِنَهُمْ فِيهِ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ وَأَنَّ الْمَسَاجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا مَعَ اللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ وَأَنَّهُ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا ﴿١٩﴾ قُلْ إِنَّمَا أَدْعُو رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِهِ أَحَدًا ﴿٢٠﴾ قُلْ إِنِّي لَا أَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا رَشَدًا ﴿٢١﴾ قُلْ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ اللَّهِ أَحَدٌ وَلَنْ أَجِدَ مِن دُونِهِ مُلْتَحَدًا ﴿٢٢﴾ إِلَّا بَلَاغًا مِّنَ اللَّهِ وَرِسَالَاتِهِ وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَإِنَّ لَهُ نَارَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا ﴿٢٣﴾ حَتَّىٰ إِذَا رَأَوْا مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾ قُلْ إِنْ أَدْرِي أَقَرِيبٌ مَّا تُوعَدُونَ أَمْ يَجْعَلُ لَهُ رَبِّي أَمَدًا ﴿٢٥﴾ عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَىٰ غَيْبِهِ أَحَدًا ﴿٢٦﴾ إِلَّا مَنِ ارْتَضَىٰ مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا ﴿٢٧﴾ لِّيَعْلَمَ أَن قَدْ أَبْلَغُوا رِسَالَاتِ رَبِّهِمْ وَأَحَاطَ بِمَا لَدَيْهِمْ وَأَحْصَىٰ كُلَّ شَيْءٍ عَدَدًا ﴿٢٨﴾

﴿١٣﴾ جا بێدرۆ ئێمە کاتێك ڕێنمایمان بیست باوەڕمان پێکرد ، سا هەر کەس باوەڕ بهێنێت بە پەروەردگاری ئەوسا ئەو کەسە با نەترسێت نە لە کەمکردنەوەی چاکەکانیو نە لە ستەم لێکردن، ﷲ دادپەروەرەو بە زیانی هیچ بەندەیەکی خۆی ڕازی نیەو چاکەکانیشی بەلای کەمەوە بە دە بەرانبەر بۆ هەژمار دەکات.

﴿١٤﴾ خۆ بێگومان لەناو ئێمەدا هەم موسڵمانو هەم ستەمکار هەیە ئەوسا هەر کەسێك موسڵمان بێت جا ئەوانە ڕێگای ڕاستو چاکیان بینیوەتەوە، سەر ئەنجامیشیان خۆشیو بەهەشتی هەتاهەتاییە.

﴿١٥﴾ وە ئەوانەیش کە ستەمکارن ئەوسا ئەوانیش سوتەمەنیوداری ئاگری دۆزەخن.

﴿١٦﴾ جا بێگومان ئەگەر لەسەر ئەو ڕێگە ڕاستە بەردەوامبن بەدڵنیاییەوە بەلێشاوی تێر ئاویان دەکەین، یان ئەگەر لەسەر ئەو ڕێبازە هەڵەی خۆیان بەردەوام بن تێرئاویان دەکەینو منەتمان پێیان نیە زۆر نابات دێنەوە بەردەستمان بۆ حیساب.

﴿١٧﴾بەو ئاوە زۆرو بەروبومەی ئەو ئاوە تاقیان دەکەینەوە ، جا ئەو کەسەی کە پشتی لە یادی پەروەردگاری خۆی کرد، ﷲسزای سەختی بەسەردا دەدات.

﴿١٨﴾ ئەوسا بێگومان مزگەوتەکان موڵکی خودان، جا بەندایەتی جگە لە ﷲ بۆ کەسێکی تر نەکەن لەو مزگەوتانەداو ئەو شوێنانە تایبەت بکەنەوە بۆ بەندایەتیو یادی پەروەردگار. ئەمە کاتێك دابەزی کەگاورو جولەکەکان لەناو مزگەوتەکانیانداو خەڵکی مەکە لەناو بەیتدا سێ سەدو شەست بتیان دانابو و لە غەیری ﷲ دەپاڕانەوە، جا ﷲ هەڕەشەی لێکردن، خۆ ئێستایش لەناو ماڵەکانی ﷲ دا دادەنیشنو خەریکی شیرکی تەریقەتو حیزبایەتینو بیریان لەلای خاوەنی ڕاستەقینەی مزگەوت نیەو هەریەکەیان غەیبەتی ئەوی تریان دەکات، بەڵکو زۆرجاریش پیلان بۆ یەکتری دادەنێن؟! بیربکەنەوە، بزانن کە چەند دوورن لەو خودایەی کە دەفەرموێ: ﴿بڕواداران هەر برای یەکترن جا ئاشتەوایی بکەن لەنێوان براکانتداو لەخوا بترسن بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت﴾حوجورات/١٠.

بەوە لە خۆتان غەرا مەبن کە پلە یان پارە یان ناوێکتان هەیە هەموی ئەمانەتەو لێتان وەردەگیرێتەوە ئەمانە هەموویان دواییان دێتو بە ڕووتوقوتی لەوانە لەناو گۆڕ دەنرێن، وەڵامێ کێ براو کێ خوشکتان ئامادە بکەن هەی سەرگەرم بە خۆشیو لەزەتی ژیانەوە، جا بزانە کە مزگەوتیش ئادابی تایبەتی خۆی هەیە بۆنمونە:

پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ:{ إِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَبِيعُ أَوْ يَبْتَاعُ فِي الْمَسْجِدِ فَقُولُوا لَا أَرْبَحَ اللَّهُ تِجَارَتَكَ وَإِذَا رَأَيْتُمْ مَنْ يَنْشُدُ فِيهِ الضَّالَّةَ فَقُولُوا لَا أَدَّى اللَّهُ عَلَيْكَ/ الدارمي، صححه الألباني/ هەرکاتێ دیتان کەسێك دەفرۆشێ یان دەکرێت لەمزگەوتدا ئەوسا ئێوەش بڵێن: خوا بازرگانیەکەت سودبەخش نەکات، وەهەر کاتێك دیتان کەسێك لەمزگەوتدا هەواڵپرسی ونبویەك دەکات ئەوسا ئێوەش بڵێن: خوا نەیداتەوەپێت}

ئەی کەی دروستەو چۆن ناترسیت کەدانیشی لەماڵی ﷲداوخەریکی بلاوکردنەوەی دژی ئاینی خوابیت؟ خەریکی چەواشە کردنی ڕۆڵەی موسڵمان بیتو بەناوی ئاینەوەموسڵمانان پارچە پارچە بکەیتو لەبەر پلەو پارەو ناو و شۆرەت لەگەل باوەڕداردا دوژمن بیتو لەگەل بێباوەڕاندا دۆست؟!

﴿١٩﴾ خۆ بێگومان کاتێك کەبەندەی ﷲ محمد ﷺهەڵسا بۆ نوێژکردن جنۆکەکان بەپەلە ئەوەندە لەسەر شانیەوە بەرەو سەر دانیشتن وەکو یەك پارچەی لێهاتبو، یان کاتێك ئەم بەندەی خودایە دەستی دایە بانگەوازی ئیسلام مرۆڤ و جنۆکە هەر هەمویان هەوڵی ئەوەیان دا کە ئەم نورە بکوژێننەوە، بەڵام پەروەردگار نوری خۆی سەرخست بەسەر نەیارو دژمنانیدا.

لە ئیبنو عەباسەوە هاتوە کە وتویەتی: { قَوْلُ الْجِنِّ لِقَوْمِهِمْ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا قَالَ لَمَّا رَأَوْهُ يُصَلِّي

سُورَةُ المُزَّمِّل ٧٣ — ٢٠

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ﴿١﴾ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٢﴾ نِّصْفَهُۥٓ أَوِ ٱنقُصْ مِنْهُ قَلِيلًا ﴿٣﴾ أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ إِنَّا سَنُلْقِى عَلَيْكَ قَوْلًا ثَقِيلًا ﴿٥﴾ إِنَّ نَاشِئَةَ ٱلَّيْلِ هِىَ أَشَدُّ وَطْـًٔا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴿٦﴾ إِنَّ لَكَ فِى ٱلنَّهَارِ سَبْحًا طَوِيلًا ﴿٧﴾ وَٱذْكُرِ ٱسْمَ رَبِّكَ وَتَبَتَّلْ إِلَيْهِ تَبْتِيلًا ﴿٨﴾ رَّبُّ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱتَّخِذْهُ وَكِيلًا ﴿٩﴾ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَٱهْجُرْهُمْ هَجْرًا جَمِيلًا ﴿١٠﴾ وَذَرْنِى وَٱلْمُكَذِّبِينَ أُو۟لِى ٱلنَّعْمَةِ وَمَهِّلْهُمْ قَلِيلًا ﴿١١﴾ إِنَّ لَدَيْنَآ أَنكَالًا وَجَحِيمًا ﴿١٢﴾ وَطَعَامًا ذَا غُصَّةٍ وَعَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلْأَرْضُ وَٱلْجِبَالُ وَكَانَتِ ٱلْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا ﴿١٤﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَآ إِلَيْكُمْ رَسُولًا شَٰهِدًا عَلَيْكُمْ كَمَآ أَرْسَلْنَآ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ رَسُولًا ﴿١٥﴾ فَعَصَىٰ فِرْعَوْنُ ٱلرَّسُولَ فَأَخَذْنَٰهُ أَخْذًا وَبِيلًا ﴿١٦﴾ فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿١٩﴾

وَأَصْحَابُهُ يُصَلُّونَ بِصَلَاتِهِ فَيَسْجُدُونَ بِسُجُودِهِ قَالَ تَعَجَّبُوا مِنْ طَوَاعِيَةِ أَصْحَابِهِ لَهُ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا / ابوداود، صححه الألباني/ قسەی جنۆکەکان بۆ گەلەکەیان ئەمەبو﴿کاتێ ئەوبەندەیە هەڵسا بۆنوێژ هەمویان کۆبونەوە لەسەری نزیك بو ببن بەیەك پارچە لەسەری﴾

وتی: کاتێ کە دییان خۆیو یارەکانی نوێژ دەکەن کە نوێژ دەکەن وەکو ئەو سوجدە دەبەن وەکو ئەو، وتی: سەریان سوڕما لەوگوێڕایەڵیەی یارەکانی بۆیو بەگەلەکەیان وت:﴿ لَمَّا قَامَ عَبْدُ اللَّهِ يَدْعُوهُ كَادُوا يَكُونُونَ عَلَيْهِ لِبَدًا / لەکاتێکدا ئەوبەندەیە هەڵساو نوێژی کردنزیك بو وەك کۆپارەی حوشتر لەسەریەوە کۆببنەوە} واتە: ئەوەندە گوێڕایەڵی بون هەر کەسەیان دەویست زیاتر لێی نزیك ببێتەوە، ئینو عەباس ئەمەیشی هەر بەقسەی جنۆکەکان داناوە.

﴿٢٠﴾ ئەی محمد ﷺبلێ: من هەر پەروەردگار ی خۆم دەپەرستم و هیچ کەسێك ناکەم بە هاوبەشی.

﴿٢١﴾ ئەی محمد ﷺبلێ: بێگومان من خاوەنی هیچ زیانو سودێك نیم بۆ ئێوە، زیانو سود هەر بە دەست الله یە، ئیتر تاکەی دنیا پەرستان خەڵك دەخەڵەتێنن بۆ ئەوەی سودێکی چاك لە نەزانان وەرگرن پێیان دەڵێن: هاوار لەمو لەو بکەن دێن بە هاناتانەوەو مەرامتان بۆ حاسڵ دەکەن هەی دین فرۆشان بە دنیا دڵنیابن کە دنیایشتان دەڕواتو دینیشتان، بەسە واز لەو دەستبڕیو عەوام خەڵەتاندنە هەڵگرنو تەماشای قورئان بکەن، پێغەمبەر ﷺنەتوانێت نە زیانو نە سود بە خەڵك بگەیەنێت ئەی کام شێخو کام ئیمامو ئیمامزادە لەو بەرێزترو بەتواناترن کە ئەم مافە لە الله بستینن بۆ خۆیان؟! ئینجا زیاتر ئەم باسەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿٢٢﴾ ئەی محمد ﷺ بلێ: ئەگەر دژایەتی الله بکەم هەرگیز کەس نیە لە تۆڵەی ئەو بمپارێزێتو هەرگیز جگە لەو هیچ پەنایەکی ترم نیە، دەی ئیتر نازانم دین فرۆشان کێیان بینیوەتەوە لەو پێغەمبەرە ﷺپایە بەرزترو هاوشانی الله بێتو بتوانێت هەر کەسێك ئارەزوی لێ بێت پەنای بداتو لەسەر پردی سیرات دەستی بگرێتو ماوە بە مەئمورینی الله نەدات بە سزادانی؟! گەر بە ئەندازەی زەڕەیەك دینت هەبێت ئەم چەند ئایەتە بەسە بۆ وازهێنان لەو خەڵك خەڵەتاندنە بەناوی دینەوە.

﴿٢٣﴾ ئەو تەنها گەیەنەرێکە لەلایەن خوداوە گەیەنەری پەیامەکەیەتیو هەر کەسێکیش دژایەتی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺبکات ئەوسا بێگومان ئاگری دۆزەخی بۆ هەیە، تێیدا دەمێننەوە هەتا هەتایە،

﴿٢٤﴾ تا ئەو کاتەی کە ئەوەی بەڵێنیان پێدراوە دێتە بەرچاویان، ئەوسا دەزانن کێ یارمەتیدەری لاوازترەو لە ژمارەیشدا کەمترە.

﴿٢٥﴾ ئەی محمد ﷺبلێ: من نازانم ئەو بەڵێنەی کە الله بە ئێوەی داوە نزیکە یان پەروەردگارم ماوەیەکی درێژی بۆ داناوە.

﴿٢٦﴾زانەری هەمو نادیارەکانەو هیچ کەسێکیشی بەسەر نهێنیەکانی خۆیدا ئاگادار ناکات.

﴿٢٧﴾مەگەر بۆ کەسێك کە لێی ڕازی بێت لە نێردراوەکانی ئەوسا ئەوێش لە بەردەمیەوەو لەپشتیەوە پاسەوانی بۆ دادەنێت تا نە کەس لەوەوە شتێك بزانێتو نە کەسێکیش بتوانێت زیادوکەمی لێ بکات ، واتە: پەیامەکەی بێ غەلوغەش بێ ئەوەی کەس پێی بزانێت پێی دەگات.

﴿٢٨﴾هەتا بزانێتو بۆ خەڵکی دەربخات کە بەڕاستی ئەوانە بە تەواوی‌و بەبێ کەمو زیاد سپاردەکانی پەروەردگاری خۆیانیان گەیاندوەو ئەو گەمارۆی ئەوەی داوە کە لەلای ئەواندا هەیەو هیچ شتێکیان لە زانستی ئەو دەرناچێتو هەمو شتێکیشی ژماردوە.

لەلای ڕاڤەکاران لەسەر فاعل (لِيَعلَمَ) ناڕێکی هەیەو ئێمە لەسەر ئەو ڕایە ماناەمان کردوە کە بۆ خوا بگەڕێتەوە ئەگەرچی دەگونجێت فاعیلەکەی (پێغەمبەرمان ﷺیان هەر پێغەمبەرێك، یان جبرەئیل یان شەیتان یان بێباوەڕان بێت. والله أعلم).

## ٧٣ سورەتی موزەمیل ٢٠

سورەتی موزەمیل کە سورەتی حەفتاو سێ هەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەو، هەندێك وتویانەکە ئایەتی ﴿إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ...الایە﴾ لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوەو بیست ئایەتە. بەگوێرەی دابەزین دووهەم سورەتەو پاش(المدثر) وپێش (القلم) دابەزیوە بەڵام هەندێکی تر پێیان وایە پاش (المدثر) سورەتی (القلم) دابەزیوە ئینجا ئەم سورەتە دابەزیوە لەسەر ئەم رایە سورەتی سێ هەمە.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی ئەو کەسەی کە خۆتت داپۆشیوە. مەبەستی پێغەمبەرﷺ چونکەکاتێك وەحی بۆ هاتو گەڕایەوە ماڵەوە لەرزگرتیو فەرموی: داميۆشن، خوایش بەو وشە جوانە دەیدوێنێتو پاشان پێی دەفەرموێ:

(٢) شەو هەستەوە بۆ بەندایەتیکردن، مەگەر کەمێك لە شەو نەبێت واتە زۆر کاتەکانی شەو بە بەندایەتیەوە تەواوبکە، بەم شێوەیە: -

(٣)نیوەی شەو یان کەمێك لەو کەمتربکەرەوە بۆ یەك تەقسیم سێی شەو،

(٤)یان زیادی بکە بۆ دوو بەش لە سێ بەشی شەو بە ئارەزۆی خۆت بەو شێوەیە بەندایەتی بکە لە شەوداو قورئان بخوێنە بە شێوەیەکی هێواش‌و بە جۆرێك کە ماڨ هەمو پیتەکانت دابێت، سەعدی کوڕی هیشام دەڵێت: بە دایکی باوەڕداران خاتون عایشەم وت: شەو نوێژی پێغەمبەر چۆن بوە؟وتی:{ أَلَسْتَ تَقْرَأُ يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ قُلْتُ بَلَى قَالَتْ فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ افْتَرَضَ قِيَامَ اللَّيْلِ فِي أَوَّلِ هَذِهِ السُّورَةِ فَقَامَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَأَصْحَابُهُ حَوْلًا وَأَمْسَكَ اللَّهُ خَاتِمَتَهَا اثْنَيْ عَشَرَ شَهْرًا فِي السَّمَاءِ حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ فِي آخِرِ هَذِهِ السُّورَةِ التَّخْفِيفَ فَصَارَ قِيَامُ اللَّيْلِ تَطَوُّعًا بَعْدَ فَرِيضَةٍ /مسلم/ وتی: [يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ]ت نە خوێندوەتەوە؟ وتم ئەی چۆن؟ وتی: بێگومان خوای دەسەڵاتداری گەورە لەسەرەتای ئەم سورەتەوە شەونوێژی فەرزکرد، جاپێغەمبەرﷺو یارەکانی ساڵێك ئەم شەونوێژەیان ئەنجام دا اللّٰه کۆتاییەکەی دوانزە مانگ گیردا لەئاسماندا هەتا اللّٰه لەکۆتایی ئەم سورەتەدا سوك کردنەوەی دابەزاند، ئینجا هەستانەوە بۆ شەو نوێژ بو بە سونەت پاش ئەوەی کە فەرزبو}

لەئەنەس پرسیار کرا کەخوێندنەوەی پێغەمبەرﷺ بۆقورئان چۆن بوە؟ ئەویش وتی: { كَانَتْ مَدًّا ثُمَّ قَرَأَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ يَمُدُّ بِبِسْمِ اللَّهِ وَيَمُدُّ بِالرَّحْمَنِ وَيَمُدُّ بِالرَّحِيمِ /البخاري/ درێژ کردنەوەبووە، پاشان﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ ﴾ خوێندەوە کە بسم الله ی درێژ دەکردەوە، الرحمن درێژ دەکردەوە ، الرحيم درێژ دەکردەوە} بەڵێ ئەو شەونوێژە فەرزکرا لەسەریان تا ئامادەیان بکات بۆ وەرگرتنی کارە سەختەکانی لەمەو پاشیان وەك دەفەرموێ:

(٥)بێگومان بەم زوانە قسەی قورس‌و گرانت بەسەردادەدەین،

(٦) بە بێشکیش کە بێداری شەو زۆر بەهێزترە لەسەر وەرگرتن‌و تێگەیشتن لەو شتەی کە دەیخوێنێتەوەو قسەکانیش جوانتر‌و ڕۆشنتر وەردەگیرێت تێیدا، چونکە کاتێکی ئارامەو بێ قەپ قاڵەو مرۆڤیش وشیارە لەو کاتەدا کە چی دەخوێنێت‌و ماناو مەبەستی چیە ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی ترەوە،

(٧) چونکە بێگومان لە ڕۆژدا تۆ بۆ کاروباری ژیانت هاتوچۆو گەڕانی درێژت هەیەو ناتوانیت ئەو قورئانەی کە بۆت دادەبەزێت بیخوێنی‌و کاتەکانت لێ تەنگتر دەبێتەوە.

(٨) یادی پەروەردگارت بکەو بۆ بەندایەتی ئەو خۆت لە شتانی تر ببچڕە بە بچڕاندن،

(٩)پەروەردگاری ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوایە، کەهیچ پەرستراوێکی ڕاستەقینەی تر نیە بێجگە لەئەو زاتە، جا تۆش هەر ئەو بکە بە پشتیوان‌و زامنی خۆت.

(١٠) خۆت بگرە لەسەر ئەو قسە نا پەسەندانەی کە ئەوان دەیکەن‌و وازیان لێ بهێنەو وەڵامیان مەدەرەوە بە وازهێنانێکی جوان،

(١١) سا واز لە منیش بهێنە لەگەڵ ئەو بێ باوەڕانەی کە خاوەنی خێروبێرن تۆکەمێك ماوەیان پێبدە،

(١٢)بەبێگومان ئێمە تۆڵەی سەخت‌و دۆزەخمان لایە.

(١٣)جاخواردنێکیش کە لە ناخۆشیدا لە قوڕگدا گیردەبێت‌و سزایەکی بەژانیش بۆستەمکاران و سپڵەو خوانەناسان. ئەوەش کەی؟

(١٤)ئەو ڕۆژەی کە زەوی دێتە حەشۆکان‌و چیاکان دەبن بە تەپۆڵکەی لی خزۆك کە هەر لەخۆیەوە دێتەخوار پاش ئەوەی کە ئەوچیابە هێزو ئەو بەردە ڕەقەبون، پاش ئەوەیش دەبێت بە تۆزو با دەیبات‌و هەمو چاڵ‌و چوڵەکانی زەوی پێ پڕدەکاتەوە وەکو لە سورەتی (طه)دا باسی فەرمو. جا پاش ئەورووداوە گرنگە نەمانی گیانلەبەرو زیندوکردنەوەیان‌و بگرەو بەردەو نامەی کردارەکان‌و پاشان بەبەهەشت یان دۆزەخ کۆتای بەم کێشەیەدێت. ئینجا دێتەوە سەر باسی پێغەمبەرایەتی‌و دەفەرموێ:

إِنَّ رَبَّكَ يَعْلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدْنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيْلِ وَنِصْفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَ ۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحْصُوهُ فَتَابَ عَلَيْكُمْ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ ۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِى ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ وَءَاخَرُونَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ فَٱقْرَءُوا۟ مَا تَيَسَّرَ مِنْهُ ۚ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقْرِضُوا۟ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا ۚ وَمَا تُقَدِّمُوا۟ لِأَنفُسِكُم مِّنْ خَيْرٍ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيْرًا وَأَعْظَمَ أَجْرًا ۚ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌۢ ﴿٢٠﴾

## ٧٤ سُورَةُ المُدَّثِّرِ ٥٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ ﴿١﴾ قُمْ فَأَنذِرْ ﴿٢﴾ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ ﴿٣﴾ وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ ﴿٤﴾ وَٱلرُّجْزَ فَٱهْجُرْ ﴿٥﴾ وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ ﴿٦﴾ وَلِرَبِّكَ فَٱصْبِرْ ﴿٧﴾ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ ﴿٨﴾ فَذَٰلِكَ يَوْمَئِذٍ يَوْمٌ عَسِيرٌ ﴿٩﴾ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ غَيْرُ يَسِيرٍ ﴿١٠﴾ ذَرْنِى وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْتُ لَهُۥ مَالًا مَّمْدُودًا ﴿١٢﴾ وَبَنِينَ شُهُودًا ﴿١٣﴾ وَمَهَّدتُّ لَهُۥ تَمْهِيدًا ﴿١٤﴾ ثُمَّ يَطْمَعُ أَنْ أَزِيدَ ﴿١٥﴾ كَلَّآ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ لِـَٔايَـٰتِنَا عَنِيدًا ﴿١٦﴾ سَأُرْهِقُهُۥ صَعُودًا ﴿١٧﴾

(١٥) بێگومان ئێمە پێغەمبەرمان ناردە لای ئێوە كە شایەت بێت لەسەرتان هەروەكو چۆن بۆ لای فیرعەون موسا پێغەمبەرمان عليه السلام نارد.

(١٦) جا فیرعەون سەرپێچی لە فەرمانی ئەو پێغەمبەرە كرد ئەوسا ئێمەش بە گرتنێكی توند گرتمان‌و لە دەریای نیل پاش ڕزگاربونی موساو پەیڕەوانی خۆی‌و پەیڕەوانیمان خنكاند ، جا ئێوەیش ئاگاتان لەخۆتان بێت‌و لە فەرمانی ئەم پێغەمبەرەتان دەرنەچن ئەگینا بەر تۆڵەو غەزەبی من دەكەون‌و وەكو فیرعەون دوچاری ڕۆژی ڕەشی خۆتان دەبن.

(١٧) ئەگەر بێباوەڕبن چۆن خۆتان دەپارێزن لە ڕۆژێك كە منداڵی تازە لەدایكبوی تێدا سەر سپی دەكات لە ترسا، پێغەمبەرمان ﷺ لەباسی هاتنی قیامەتدا دەفەرموێ: { ثُمَّ يُنْفَخُ فِي الصُّورِ فَلَا يَسْمَعُهُ أَحَدٌ إِلَّا أَصْغَى لِيتًا وَرَفَعَ لِيتًا قَالَ وَأَوَّلُ مَنْ يَسْمَعُهُ رَجُلٌ يَلُوطُ حَوْضَ إِبِلِهِ قَالَ فَيَصْعَقُ وَيَصْعَقُ النَّاسُ ثُمَّ يُرْسِلُ اللَّهُ أَوْ قَالَ يُنْزِلُ اللَّهُ مَطَرًا كَأَنَّهُ الطَّلُّ أَوْ الظِّلُّ نُعْمَانُ الشَّاكُّ فَتَنْبُتُ مِنْهُ أَجْسَادُ النَّاسِ ثُمَّ يُنْفَخُ فِيهِ أُخْرَى فَإِذَا هُمْ قِيَامٌ يَنْظُرُونَ ثُمَّ يُقَالُ يَا أَيُّهَا النَّاسُ هَلُمَّ إِلَى رَبِّكُمْ وَقِفُوهُمْ إِنَّهُمْ مَسْئُولُونَ قَالَ ثُمَّ يُقَالُ أَخْرِجُوا بَعْثَ النَّارِ فَيُقَالُ مِنْ كَمْ فَيُقَالُ مِنْ كُلِّ أَلْفٍ تِسْعَ مِائَةٍ وَتِسْعَةً وَتِسْعِينَ قَالَ فَذَاكَ يَوْمَ يَجْعَلُ الْوِلْدَانَ شِيبًا وَذَلِكَ يَوْمَ يُكْشَفُ عَنْ سَاقٍ /مسلم وغيره/ پاشان فودەكرێت بەكەلەشاخدا، جا هەركەس بیستی لایەكی ملی نزم دەكاتەوە بۆ بیستن‌و لایەكەی تری بەرزدەكاتەوە، فەرموی: یەكەم كەسێك كەدەیبیسێت پیاوێكە كە خەریكی چاك كردنی حەوزی حوشترەكەیەتی، فەرموی: جا بێهۆش دەكەوێت‌و دەمرێت‌و خەڵكیش بەدوای ئەودا دەمرن، پاشان الله بارانێك دەنێرێ یان فەرموی: دادەبەزێنێ هەروەك بارانێكی ورد یان وەك سێبەرێك (نوعمان كەوتوەتە دوودڵیەوە.لەراستیدا مانای بەبارانی ورد ڕێك ترە لەگەل ریوایەتەكانی تردا) جا لەو بارانەوە لەشەكانی خەڵك دەڕوێتەوە، پاشان جارێكی تر فوی پێدا دەكرێتەوە، جا لەوددەمەدا كتوپڕ هەڵدەسنەوە لەپاشان دەوترێت: ئەی خەڵكینە ئامادەبن لەپێشگای پەروەردگارتانداو بوەستن بێگومان پرسیارتان لێدەكرێت، فەرموی: پاشان دەبێژرێت: بەشی ئاگر دەر بهێنن، جا دەوترێت: لەچەند؟ ئەوسا دەوترێت:لەهەمو هەزارێك نۆسەدو نەوەدو نۆ كەس(واتە لەهەزار كەس یەك كەس بەهەشتی دەبێت)فەرموی:جائەو كاتەیە﴿ئەو ڕۆژەی كەمناڵ سەر سپی دەكات﴾وەئەوە﴿ئەو ڕۆژەیە كەلاقی بۆروت دەكرێت﴾.

(١٨) بە هاتنی ئەو ڕۆژە ئاسمان شەق دەبات، (ئەمە بەڵێنی خودایەو) بەڵێنی ئەویش جێ بەجێكراو دەبێت‌و گەڕانەوەو نەهاتنەدی نیە.

(١٩) بەڕاستی ئەم سورەتە ئامۆژگاریەكی گەورەیە، جا ئەو كەسەی كە ئارەزۆی لێیە با بەرەو پەروەردگاری خۆی ڕێگا بگرێتەبەر ئەوسا ئەوە سەرئەنجام بە پەروەردگاری خۆی دەگات‌و پاداشتی چاكەكانی لەو زاتە گەورەیە وەردەگرێت، ئینجا كۆتایی سورەتەكە پەیوەند دەداتەوە بە سەرەتایەكەیەوە كە باسی شەو نوێژ بو دەفەرموێ:

(٢٠) بێگومان پەروەردگارت دەزانێت كە بێگومان تۆو هەندێك لەو كەسانەش كە لەگەڵ تۆدان هەستاون بۆ شەونوێژ نزیك بە دووبەش لە سێ بەشی شەو ونزیك بەنیوەی‌و نزیك بە سێ یەكی‌و خوا هەر خۆیەتی ئەندازەی شەو و ڕۆژ دیاری دەكات، كە دەزانێت ئێوە هەرگیز بۆتان ناژمێررێت ، جا لەسەری سوك كردن‌و چاوپۆشی لێكردن ، ئەوسا بەو ئەندازەی كە دەتوانن لە شەونوێژدا لە قورئان بخوێنن، ئەو دەزانێت بەڕاستی لێتان نخۆش دەكەوێت، هەندێكتان بۆ بەدەست هێنانی ڕۆزی الله بەملاو بەولای زەویدا دەڕۆن، هەندێكیشتان شەڕ دەكەن لە ڕێگای بەرزكردنەوەی ئایینی اللهدا، جا بەو ئەندازەی كە دەتوانن ئەوەندە لەو قورئانە بخوێنن‌و نوێژ بكەن‌و زەكات بدەن‌و قەرزی جوان بە الله بدەن، واتە ماڵ ببەخشن لە ڕێگای اللهداو ئەوەی كە پێشی دەخەن لە چاكە بۆ خۆتان لە پاشەرۆژدا لەلای الله دەستتان دەكەوێتەوە كە ئەوە چاكترەو گەورەترە لەبارەی

پاداشتەوەو داوای لێخۆشبون بکەن لە اللهﷻ، بێگومان کە اللهﷻ زۆر چاوپۆشیکەرو بێنیهایەت میهرەبانە، لە فەرموودەی سەحیحدا هاتوە کە پێغەمبەرمان ﷺ فەرویەتی:{أَيُّكُم مَالُهُ أحبُّ إلَيهِ مِن مَالِ وَارِثِهِ/ کامتانماڵی خۆتانتان لە ماڵی واریس زیاتر خۆشدەوێت؟ وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ هیچکام لە ئێمە نیە مەگەر ماڵی خۆی زیاتر خۆش بوێت لە ماڵی واریسی. فەرموی:{أعلِمُوا مَا تَقُولُون؟/ ئایادەزانن چی دەڵێن؟ وتیان: هەر ئەمە دەزانین ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموی:{إنَّمَا مَالُ أحَدِكُم مَاقَدَّمَ وَمَالُ وَارِثِهِ مَاأخَّرَ/ النسائي، صحىحه الألباني/ ماڵی هەریەك لە ئێوە ئەوەیە کە لە پێش مردنی خۆیدا لە چاکەدا خەرجی کردوە، وە ئەوەی پاش خۆی ماڵی واریسیەتی}.

## سورەتی مودەسیر ٧٤ ٥٦

سورەتی مودەسیر کە سورەتی حەفتاو چوارەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە ، بەقسەی هەموانو پەنجاو شەش ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی دووهەمەو پاش سورەتی (العلق) و پێش (المزمل) دابەزیوە.

جا بیری کوڕی عەبدوڵا دەڵێت: بیستم لەپێغەمبەرەوە ﷺ کە لە بارەی بچڕانی وەحیەوە قسەی دەکرد جا لەباسەکەیدا فەرموی: {بَيْنَمَا أنَا أمْشِي سَمِعْتُ صَوْتًا مِنَ السَّمَاءِ فَرَفَعْتُ رَأسِي فَإذَا المَلَكُ الَّذِي جَاءَنِي بِحِرَاءَ جَالِسٌ عَلَى كُرْسِيٍّ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ فَجَئِثْتُ مِنْهُ رُعْبًا فَرَجَعْتُ فَقُلْتُ زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي فَدَثَّرُونِي فَأنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ﴾إلَى ﴿فَٱهْجُرْ﴾ قَبلَ أنْ تُفرَضَ الصَّلاةُ /الترمذي،صحىحه الألباني/ لەکاتێدا کەدەرۆیشتم دەنگێکم لەئاسمانەوە بیست ، جا سەرم بەرز کردوە دیم ئەو فریشتەیەیە کە لە ئەشکەوتی حەرا دا هات بۆلام کە لەنێوان ئاسمانو زەویدا لەسەر کورسیەك دانیشتوە ، جا لەترسی ئەو بە ئەژنۆدا کەوتمو ئەوکاتەی کە گەڕامەوە وتم داپۆشن، داپۆشن، جادایان پۆشیم ، ئەوسا خوای دەسەڵاتداری گەورە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُدَّثِّرُ قُمْ فَأَنذِرْ ﴾ إلَى ﴿فَٱهْجُرْ ﴾دابەزاند پێش ئەوەی کەنوێژ فەرزبکرێت} قَال: أبُوسَلَمَةَ: وَالرُّجزُ الاوثان – ثُمَّ حَمِيَ الوَحيُ وَتَتَابَعَ/ئەبو سەلەمە دەڵێت: الرُجزَ: واتە بتەکان- پاشان گەرمەی وەحی دەستی پێکردو یەك بەدوای یەکدا دەهات}.

بەناوی اللهﷻ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەی ئەو کەسەی کە خۆت داپۆشیوە بە پۆشاکی خۆتو دەلەرزیت لەبەرئەوەی کە وەحیت بۆ هاتوە.

(٢) هەستە، جا خەڵکی بترسێنە بەسزای اللهﷻ ئەگەر باوەڕ نەهێنن. بە هاتنی ئەم سورەتە پێغەمبەر ﷺ وەکو پێغەمبەر بو، بو بە گەیەنەرو پەیام ڕەسێنیش (الرَسول) چونکە هەر کەسێك لەلایەن خواوە پەیامی بۆ هات ئەوە (نبی)یەو ئەگەر فەرمانی گەیاندنی بەسەردا درا ئەوە (رسول)یشە واتە: هەمو رەسولێك نەبیە بەڵام مەرج نیە هەمو نەبییەك رەسول بێت.

(٣)سا پەروەردگاری خۆت بە گەورە ڕا بگرەو دوورکەوە لەو وەسفانەی کە بت پەرستان بۆی دادەنێن لە هاوبەشو هاوسەرو منداڵو کچ.

(٤) جا پۆشاکەکانیشت پاك بکەرەوە، چ پۆشاکی مادی بێت یان خووڕەوشت بێت یان خێزانو ماڵەوە بێت یان پاكو خاوێنی ناو دەرون بێت، چونکە بێگومان پاكو خاوێنی هەمویان پێویستە لەسەر خۆیو ئومەتەکەیشی.

(٥)ئەوسا لەسەر دورکەوتنەوە لە بتەکان بەردەوامو‌خۆ راگربە بەوشێوەی کە فەرمانت بەسەردا دەدرێت.

(٦)جا چاکە لەگەل خەڵکدا نەکەیتو چاوەڕوانی پاداشتی زیاتری لێ بکەیت، ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ قەدەغەبوە ، بەڵام لەناو ئومەتەکەیدا ئەوە قەدەغە نیە ، چونکە پێغەمبەر ﷺ هەمو شتێکی چاکەیە بۆخەڵك، جا ئەگەر چاوەڕێی پاداشتی زیاتریان لێ بکات باریان گران دەبێتو لەوانەیە لێی نزیك نەبنەوە ، بۆیە اللهﷻ داوای لەو کردوە کە ئەو چاوەڕوانیە لە خەڵك نەکات. چەندین مانای تر کراوە کە ئەمەیان نزیکترە. والله أعلم.

(٧) جا بۆ ڕازی کردنی پەروەردگارت لەسەر ئێشو ئازاری ڕێگای بانگەوازەکەت خۆڕاگربەو پەلە مەکەو نائومێد مەبە.

(٨) هەر کاتێك فو کرا بە کە ڵەشاخدا. لەبەهزی کوڕی حەکیمەوە هاتوە کە وتویەتی: { أَمَّنَا زُرَارَةُ بنُ أوفَى رضي الله عنه فِي مَسْجِدِ بَنِي قُشَيْرٍ فَقرأَ المُدثر فلَمَّا بَلَغَ فَإِذَا نُقِرَ فِي النَّاقُورِ خَرَّ مَيِّتًا /الحاكم، صحىحه الألباني/ زورارەی کوڕی ئەبوئەوفا رضي الله عنه لەمزگەوتی بەنی قوشەیردا ئیمامەتی بۆکردین جا مودەسیری خوێند کە گەیشتەبە﴿ فَإِذَا نُقِرَ فِى ٱلنَّاقُورِ / هەر کاتێك فو کرا بە کەڵەشاخدا﴾ کەوتومرد}.

(٩) جا ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی زۆرسەختە.

(١٠)لەسەر خوانەناسان ئاسان نیە. چونکە هەر لەناو سزادان و بە هیچ شێوەیەکیش لێی رزگار نابنو هەمونەخشە و پیلانەکانیان لە دژی خواو ئایینو پێغەمبەرانو پەیڕەوانیان

إِنَّهُۥ فَكَّرَ وَقَدَّرَ ﴿١٨﴾ فَقُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿١٩﴾ ثُمَّ قُتِلَ كَيۡفَ قَدَّرَ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ نَظَرَ ﴿٢١﴾ ثُمَّ عَبَسَ وَبَسَرَ ﴿٢٢﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ وَٱسۡتَكۡبَرَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ يُؤۡثَرُ ﴿٢٤﴾ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا قَوۡلُ ٱلۡبَشَرِ ﴿٢٥﴾ سَأُصۡلِيهِ سَقَرَ ﴿٢٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا سَقَرُ ﴿٢٧﴾ لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ ﴿٢٨﴾ لَوَّاحَةٞ لِّلۡبَشَرِ ﴿٢٩﴾ عَلَيۡهَا تِسۡعَةَ عَشَرَ ﴿٣٠﴾ وَمَا جَعَلۡنَآ أَصۡحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةٗۙ وَمَا جَعَلۡنَا عِدَّتَهُمۡ إِلَّا فِتۡنَةٗ لِّلَّذِينَ كَفَرُواْ لِيَسۡتَيۡقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَيَزۡدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِيمَٰنٗاۙ وَلَا يَرۡتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۙ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ وَٱلۡكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلٗاۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهۡدِي مَن يَشَآءُۚ وَمَا يَعۡلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَۚ وَمَا هِيَ إِلَّا ذِكۡرَىٰ لِلۡبَشَرِ ﴿٣١﴾ كَلَّا وَٱلۡقَمَرِ ﴿٣٢﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذۡ أَدۡبَرَ ﴿٣٣﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَآ أَسۡفَرَ ﴿٣٤﴾ إِنَّهَا لَإِحۡدَى ٱلۡكُبَرِ ﴿٣٥﴾ نَذِيرٗا لِّلۡبَشَرِ ﴿٣٦﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَتَقَدَّمَ أَوۡ يَتَأَخَّرَ ﴿٣٧﴾ كُلُّ نَفۡسِۭ بِمَا كَسَبَتۡ رَهِينَةٌ ﴿٣٨﴾ إِلَّآ أَصۡحَٰبَ ٱلۡيَمِينِ ﴿٣٩﴾ فِي جَنَّٰتٖ يَتَسَآءَلُونَ ﴿٤٠﴾ عَنِ ٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿٤١﴾ مَا سَلَكَكُمۡ فِي سَقَرَ ﴿٤٢﴾ قَالُواْ لَمۡ نَكُ مِنَ ٱلۡمُصَلِّينَ ﴿٤٣﴾ وَلَمۡ نَكُ نُطۡعِمُ ٱلۡمِسۡكِينَ ﴿٤٤﴾ وَكُنَّا نَخُوضُ مَعَ ٱلۡخَآئِضِينَ ﴿٤٥﴾ وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ ﴿٤٦﴾ حَتَّىٰٓ أَتَىٰنَا ٱلۡيَقِينُ ﴿٤٧﴾

ئاشکرا دەبێتو ناتوانن حاشای لێ بکەن، ئیتر چۆن سەخت نیە؟ جا ﷲ دەفەرموێ:

(١١) وازم لێ بێنە بۆ ئەو کەسەی کە بە تەنهایی دروستم کردوە کەچی ئەو هاوبەشم بۆدادەنێت.

(١٢) خۆ داراییەکی زۆریشم پێداوە؛

(١٣) وە چەندین کوڕم پێداوە کە هەمیشە لەلای ئامادەن بۆ پاراستنو خزمەتکردنی.

(١٤) ئامادەم کردوە هەمو شتێك بۆی بە ئامادەکرنێکی تێروتەسەل کەچی دژایەتیم دەکات؟!

(١٥) پاشان لەگەل ئەو هەمو سپلەییو خوانەناسیەیدا هێشتا بەتەمایە بۆی زیاد بکەم؟!

(١٦) نەخێر شتی وا نابێتو تازە زیاتری پێنادەم، چونکە بەڕاستی ئەو دوژمنایەتی نیشانەکانی ئێمە دەکات، کەواتە لاساری خۆی بوەتە هۆی لەناوچونو نان بڕانیو ئێمە ستەممان لەو نەکردوە.

(١٧) بەم زوانە توشی سزای گەورەو توندی وای دەکەم بەناویدا بەرزبێتەوە، کەسێك کەهیچ هەڕەشەیەکیشی لەسەر نەبێت ئەگەر بیەوێت بەشوێنێکدا سەرکەوێت دوچاری ماندویو هەناسە تەنگی دێت، ئەی ئەگەر ئەو کەسە بە ناو ئاگرداو لەسەریەوە چڕەدوکەڵ هەبێت وبەچیای ئاگردا سەری بخەن دەبێ حاڵی چۆن بێت؟

(١٨) بێگومان ئەو بیری کردەوەو قسەکانی پێغەمبەری ﷺ هەڵسەنگاندو نەیدەزانی چی بڵێ.

(١٩) بەر نەفرینو سزا کەوێت چۆنی هەڵسەنگاندوە.

(٢٠) پاشان بەر نەفرینو سزا بکەوێت چۆنی لێکداوەتەوە.

(٢١) پاشان تەماشای کرد هەر سەری لە هیچ دەرنەچوو.

(٢٢) پاشان ڕووی گرژ کردو زۆر سپڕایە خۆیو نەیدەزانی چی بڵێت.

(٢٣) پاشان پشتی تێکردو خۆی بە گەورە گرتو نەیویست خۆی لەپێش چاوی قورەیش بشکێنێت.

(٢٤) ئەوسا وتی: ئەمە هەر جادویەکی کۆنەو محمد  هێناویەتی.

(٢٥) ئەمە هەر قسەی مرۆڤە، ئەوکەسەی ئەم قسانەی کردوە وەلیدی کوڕی موغەیرەی مەخزومیە کە یەکێك لە سەرۆکەکانی ئەو کاتەی قورەیش بووە ، کە چووە ماڵی ئەبوبەکری سدیقو لەبارەی قورئانەوە پرسیاری لێکردووە ، جا کاتێك ئەو باسی قورئانی بۆ کردووە هاتوەتە ناو قورەیشو وتویەتی کوڕی ئەبوکەبشە شتێکی سەیر دەڵێت! بەخوا ئەوە نە هەڵبەستەو نە جادوەو نە قسەی بێ سەروبەری شێتە، بێگومان ئەو قسەیە قسەی خودایە. جا کاتێك چەند کەسێکی قورەیش ئەمەیان لێ بیست کەوتنە یەك خوێندنەوەو وتیان: بەخوا ئەگەر وەلید لەم دینەی قورەیش هەڵبگەڕێتەوەو بچێتە سەر دینی کوڕی ئەبوکەبشە هەمو قورەیش پەیڕەوی دەکەنو دەچنە سەر ئەو دینە، جا کاتێك ئەبوجەهلی کوڕی هیشام بیستی، وتی: من ئەوەتان بۆ چارە دەکەم، هەستا چووە لای ماڵی وەلیدو پێی وت: ئایا نەتبینی کە گەلەکەت خێرو سەدەقەت بۆ کۆدەکەنەوە؟ جا وتی: ئەی من لە هەمویان سەروەتو سامانو منداڵم زۆرتر نیە؟ ئەبوجەهل وتی: دەڵێن: ئەو کابرایە دەچێت بۆ لای ئەبوقوحافە تا خواردنێکی دەستکەوێت، جا وەلید بەم قسەیە ڕقی هەستاو وتی: ئایا هۆزەکەم ئەم قسە دەکەن؟! دەسا سوێند بە ﷲ نە نزیك دەبمەوە لە ئەبوقوحافەوەو نە لە عومەرو نە لە کوڕی ئەبوکەبشەوەو قسەکەشی هەر جادوەو دەست بەدەست بە محمد گەیشتوە ، جا ﷲ ئەم ئایەتانەی نارد بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ لەئایەتی: ﴿ذَرۡنِي وَمَنۡ خَلَقۡتُ وَحِيدٗا﴾ هەتا ﴿لَا تُبۡقِي وَلَا تَذَرُ﴾/البيهقي،صحيح السيرة/ ئینجا دەفەرموێ:

(٢٦) بەم زووانە دەیخەینە ناو سەقەرەوە.

(٢٧) جا تۆ نازانیت سەقەر چیە؟

(٢٨) سەقەر نە هیچ شتێك لە گۆشتو دەمار دەهێڵێتو نە وازیشی لێدەهێنێت بەڵام نامرێتو هەمیشە بۆی چاك دەکرێتەوەو دەسوتێنرێت.

(٢٩) پێستی هەڵدەقرچێنێتو دەیسوتێنێت.

(٣٠) نۆزدە فریشتەی گەورەو دڵڕەق فەرماندارن لەسەر ئەو سەقەرە.

(٣١) خۆ ئێمە جگە لە فریشتەکان کەسانێکی ترمان نەکردوە بە فەرمانداری ئاگرو ژمارەی ئەوانمان ( بە نۆزدە) داناوە هەر بۆ تاقیکردنەوەیە کە بۆ ئەو کەسانەی کە خوانەناسن، تا ئەوانەی کە پەڕاویان پێدراوە دڵنیابن لەڕاستی پێغەمبەر ﷺ چونکە ڕێکە لەگەڵ ئەوەی کە بۆ ئەوان هاتوە، وەتا باوەڕدارانیش باوەڕەکەیان زیاتر ببێت، تا نە ئەوانەی کە پەڕاویان پێدراوەو نە باوەڕداران گومانیان نەمێنێت لە ڕاستیو دروستی محمد ﷺ و پەیامەکەیدا، وە تا ئەوانەی کە دڵنخۆشنو ئەوانەش کە خوانەناسن بڵێن: مەبەستی ﷲ چیە لەم نمونانەدا (وبۆچی باسی مێشولەو جاڵجاڵۆکە دەکات؟!) هەروەها خودا باسدەکاتو نمونەش دەهێنێتەوەو ئەو کەسەی کە ئارەزۆی لێبێت سەری لێ تێکدەدات، ئەو کەسەش کە ئارەزۆی لێبێت خۆشبەختی دەکات بە ڕێنمویەکانیو سەربازانی پەروەردگارت (ئەوەندە زۆرە کەس ژمارەیان نازانێت) مەگەر هەر ﷲ خۆی بزانێت، ئەم سەقەرەیش (دۆزەخ) هەر بۆ بە بیرهێنانەوەیە بەڵکو لەو سزایە بترسنو ڕێگای ڕاست هەڵبژێرن، لە فەرمودەیەکدا کە ئیمامی مسلمو ترمزی هێناویانە هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی: {يُؤتَى بِجَهَنَّم يَومَئِذٍ لَهَا سَبعُونَ ألفَ زِمَامٍ مَعَ كُلِّ زِمَامٍ سَبعُونَ ألفَ مَلَكٍ يَجُرُّنَها/ ئەو کاتە دۆزەخ دەهێنن حەفتا هەزار هەوساری هەیەو لەگەڵ هەر هەوسارێکدا حەفتا هەزار فریشتەیە کە ڕایدەکێشن} .

(٣٢) وانیە کەدین دژمنان دەیڵێنو سوێند بە مانگ ئەم قورئانە قسەی خودایە.

(٣٣) سا سوێند بە شەو ئەو کاتەی کە پشتی تێدەکاتو بۆی هەڵدێ.

(٣٤) جا سوێند بە بەرەبەیانی ئەو کاتەی کە دەردەکەوێتو زاڵدەبێت بەسەر تاریکیدا.

فَمَا تَنفَعُهُمۡ شَفَٰعَةُ ٱلشَّٰفِعِينَ (٤٨) فَمَا لَهُمۡ عَنِ ٱلتَّذۡكِرَةِ مُعۡرِضِينَ (٤٩) كَأَنَّهُمۡ حُمُرٞ مُّسۡتَنفِرَةٞ (٥٠) فَرَّتۡ مِن قَسۡوَرَةِۭ (٥١) بَلۡ يُرِيدُ كُلُّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ أَن يُؤۡتَىٰ صُحُفٗا مُّنَشَّرَةٗ (٥٢) كَلَّاۖ بَل لَّا يَخَافُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ (٥٣) كَلَّآ إِنَّهُۥ تَذۡكِرَةٞ (٥٤) فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ (٥٥) وَمَا يَذۡكُرُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ هُوَ أَهۡلُ ٱلتَّقۡوَىٰ وَأَهۡلُ ٱلۡمَغۡفِرَةِ (٥٦)

## سُورَةُ القِيَامَةِ ٧٥ — ٤٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقۡسِمُ بِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ (١) وَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلنَّفۡسِ ٱللَّوَّامَةِ (٢) أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَلَّن نَّجۡمَعَ عِظَامَهُۥ (٣) بَلَىٰ قَٰدِرِينَ عَلَىٰٓ أَن نُّسَوِّيَ بَنَانَهُۥ (٤) بَلۡ يُرِيدُ ٱلۡإِنسَٰنُ لِيَفۡجُرَ أَمَامَهُۥ (٥) يَسۡـَٔلُ أَيَّانَ يَوۡمُ ٱلۡقِيَٰمَةِ (٦) فَإِذَا بَرِقَ ٱلۡبَصَرُ (٧) وَخَسَفَ ٱلۡقَمَرُ (٨) وَجُمِعَ ٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ (٩) يَقُولُ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذٍ أَيۡنَ ٱلۡمَفَرُّ (١٠) كَلَّا لَا وَزَرَ (١١) إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمُسۡتَقَرُّ (١٢) يُنَبَّؤُاْ ٱلۡإِنسَٰنُ يَوۡمَئِذِۭ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ (١٣) بَلِ ٱلۡإِنسَٰنُ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦ بَصِيرَةٞ (١٤) وَلَوۡ أَلۡقَىٰ مَعَاذِيرَهُۥ (١٥) لَا تُحَرِّكۡ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعۡجَلَ بِهِۦٓ (١٦) إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ (١٧) فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ (١٨) ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ (١٩)

(٣٥) بەبێگومان ئەو ئاگرەبەتینەی سەقەر یەکێکە لە شتە گەورەکان.

(٣٦) کەترسێنەرە بۆگشت مرۆڤ.

(٣٧) بۆ ئەو کەسەی لەئێوە کە دەیەوێت بەرەو پێش بڕواتو ڕاستی بناسێتو پەیڕەوی بکاتو بگات بە بەهەشت یان ئەوەی کە دەیەوێت خۆی دوابخاتو خەریکی خراپە بێتو بچێتە دۆزەخ.

(٣٨) هەمو کەسێك وا لە بارمتەی ئەوەی کە کردویەتی.

(٣٩) جگە لە یارانی دەستە ڕاست.

(٤٠) کە لەناو باخاتێکی زۆرو زەبەنەدان.

(٤١) کە لەبارەی ستەمکارانەوە پرسیار دەکەن (و دەڵێن:)

(٤٢) چی ئێوەی کێشاوە بۆ ناو سەقەر؟

(٤٣) وتیان: ئێمە نوێژ نەکەر بوین.

(٤٤) جاخواردنمان بە نەداران نەدەدا.

(٤٥) وە لەگەڵ خەڵکی سەرگەرم بە گاڵتەوگەفو پڕوپوچەکاندا بوین.

(٤٦) خۆباوەڕیشمان بە ڕۆژی قیامەت نەبو.

(٤٧)هەتا مردین ئەو کاتە گەیشین بە یەقین و دڵنیابوین ئەوەی کەپێغەمبەران وتبویان هەموراستە ، بەڵام تازە چی سودێکی هەیە بۆیان خۆ زۆریش نابات لەناو سەقەردان.

(٤٨)جا تکای تکاکاران لەو ڕۆژەدا هیچ سودێك بەوان ناگەیەنێ، ئێنجا قورئان دەمانهێنێتەوە بۆ دنیا، وەکو ئەوە بڵێ بیربکەرەوە تا بەو ڕۆژە ڕەشە نەگەیشتوی فریای خۆت بکەوەو دەفەرموێ:

(٤٩)جا ئەوە بۆچی ئەوان لەم ئامۆژگاریە پشت هەڵدەچەرخێنن؟

(٥٠)ئەوانە هەروەکو ئەو کەرەکێویانە وان،

(٥١)کە لە ترسی شێر هەڵدێن. ئەوانیش ئاوا لە قورئان هەڵدێن؟!

(٥٢)نەك هەر ئەوەیش، بەڵکو هەمو کەسێك لەوان دەیەوێت چەندین پەڕەی بڵاوکراوەی لەلایەن خوداوە پێبدرێت کە فەرمانی پێ بکات بۆ پەیڕەوی کردن لەو پێغەمبەرە ﷺ.

(٥٣)شتی وا نابێت، بەڵکو ئەوان لە قیامەت ناترسن بۆیە ئاوەها بێباکن لە دژایەتی ئاییندا .

(٥٤)باش بزانن، کە ئەو قورئانە ئامۆژگاریە.

(٥٥)ئەوسا هەر کەسێك ئارەزۆی لێبێ دەیخوێنێتەو پەندی لێوەردەگرێت.

(٥٦) جا بیریش ناکەنەوەو نایخوێننەوە مەگەر خوا ئارەزۆی لێبێت، هەر ئەو زاتەیە کەشایستەی لێترسانەو هەر خۆیشی لایقە بەوەی کە چاوپۆشی بکات لە تاوانی بەندەکانی.

**٧٥ سورەتی قیامە ٤٠**

سورەتی قیامە کە سورەتی حەفتاوپێنجەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، چل ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سورەتی سی و یەکەمەو پاش سورەتی (القارعة) و پێش (الهُمزة) دابەزیوە.

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە ڕۆژی قیامەت کە ڕۆژی زیندوکردنەوەی هەمو گیانلەبەرانە بۆ حەشرو حیساب. پتی (لَآ ) زیادە لێرەو لەسەر ئایەتی دوایشدا، هەندێك دەڵێن زیاد نیە بەڵکو ئەو پیتە بۆ دووپاتکردنەوەیە یان بۆ بەرپەرچدانەوەی قسەی بت پەرستانە کە پێیان وابو کە قیامەت نیە، واتە وانیە کە ئێوە گومانی دەکەن.

(٢) سوێند بەو نەفسەی کە زۆر سەرزەنشتکەرە. ئەم جۆرە نەفسە باشەو نەفسی باوەڕدارە، چونکە باوەڕی بە حەشرو حیساب هەیە بۆیە زۆر سەرزەنشتی خاوەنەکەی دەکات لەسەر ئەو ئیشە ناپەسندانەی کە دەیانکات بەو هۆیەوە نەفسێکی باشەو خوا سوێندی پێدەخوات، پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: {مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ وَسَاءَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَذَلِكُمْ الْمُؤْمِنُ / الترمذي، صححه الألباني/ هەرکەسێك چاکەکەی دڵخۆشی کردو خراپەکەی دڵتەنگی کرد ئەوسا ئەوە باوەڕدارە} ئێنجا دەفەرموێ:

(٣)ئایا مرۆڤ وا گومان دەبات کە ئێمە ناتوانین ئەو ئێسکە ڕزیوانە کۆبکەینەوە؟

(٤) وانیە ئەوەی کە ئەوان بۆی دەچن، زیندوی دەگەینەوەو دەسەڵاتی ئەوەشمان هەیە کە سەر ئەنگوشتەکانیشی ڕێكوپێك بکەینەوە (کە ئەمەش یەکێکی ترە لە موعجیزە زۆرو زەبەنەکانی قورئان کە لێرەدا باسی سەرئەنگوشتی کردوە، چونکە ئێستا دەرکەوتوە کە ئەو هەمو مرۆڤە لەو سەر زەویە دایە هیچ کەسێك سەر ئەنگوشتی لەوی تر ناچێت، ئەمە ئەگەر قسەی خودای زاناو دانا نیە پێغەمبەرێکی نەخوێندەوار زیاتر لە هەزارو چوار سەد ساڵ لەمەو پێش چۆن ئەمەی زانیوە کە دروستکردنەوەی سەرئەنگوشت کارێکی زۆر سەختو گەورەیەو جگە لە خودا لە توانای کەسی تردا نیە؟! ئێنجا دەفەرموێ:

(٥) نەخێر، مرۆڤ هەرچەند ئامۆژگاری بکرێت ئەو هەر دەیەوێت پاشەڕۆژی خۆی خراپ بکات.

(٦)دەپرسێت کەی ئەو ڕۆژەی قیامەت دێت؟ گاڵتە بەو قسەیە دەکاتو باوەڕی بەو ڕۆژە نیە، جا پەروەردگار لە وەڵامیدا دەفەرموێ:

(٧) جا ئەو کاتەی کە چاو لە ترسانا ئەبڵەق دەبێت چونکە چاوی بەو ڕۆژە دەکەوێت کە باوەڕی پێی نەبوە.

(٨) جا کاتێك کە ڕوناکی مانگ نامێنێت.

(٩) ئەوکاتەی کە ڕۆژو مانگ کۆکرانە . کەوەکو یەکیان لێ هات لە نەمانی ڕوناکیاندا یان ئەو کاتەی کە هەردووکیان لە ڕۆژئاواوە هەڵدێن کە ئیتر ئەو کاتە تەوبە وەرناگیرێت.

(١٠)ئەو ڕۆژە مرۆڤ دەڵێت: ڕێگای ڕاکردن کوا؟ بۆ کوێ ڕابکەمو پەنا بۆ کوێ ببەم؟

(١١) وانیەو جێگای ڕاکردن نیەو ئەو ڕۆژەش هەر دێت.

(١٢) ئارامگا هەرلەلای پەروەردگارتە و پەناگاو جێگای ڕاکردنی تر بۆ کەس نیە، دەبێت بە خۆی‌و بە نامەی کردارەکانیەوە لەبەر دەمی دادگای خودا دا ئامادەبێت.

(١٣) ئەو ڕۆژە بە مرۆڤ دەوترێت کە چی پێش خستوە بۆ قیامەتی‌و چ شتێکیشی لێ بەجێماوە؟ واتە هەواڵی تەواوی کردەوەکانی لە چاك‌و لەخراپ پێدەردرێت.

(١٤) نەخێر ئەگەر ئەوەش نەبوایە، هەر مرۆڤ بۆ خۆی زۆر شارەزای خۆیەتی‌و چاك خۆی دەناسێت.

تای مودەوەرەی (ة) ی ﴿بَصِيرَةٌ﴾ بۆ مبالەغەیە وەکو (علاّمَة/ زۆر زانا) وایە".

(١٥) خۆ ئەگەر دەیان‌و سەدان بەهانەیش بهێنێتەوە هیچ سودێکی نابێت. چونکە تاوانەکانی هەموی بە تۆمارکراوی و تەسجیل کراوی و وێنەگیراوی لەپێش دەمیدا دادەنرێت‌و ناتوانێت حاشا لە هیچی بکات‌و شایەتەکانیشی هەمویان بەخۆیەوەن، دەست‌و زمان‌و لاق‌و لاشەیەتی‌و هەمویان لێی دێنە قسەو شایەتی لەسەر دەدەن. ئینجادێتەسەر باسی پێغەمبەرایەتی، پێغەمبەرمان ﷺ لەسەرەتای وەحی دا زۆر سوربو لەسەر لەبەرکردنی ئەم قورئانەو زۆر بە پەلەبو نەوەك لەبیری بچێتەوە، جا هەرکە جبرئیل دەیخوێند ئەویش بەپەلە لەگەڵیدا دەیخوێند، بەڵام پەروەردگاری میهرەبان ئەم بارەی لەسەر سوك کردو فەرموی:

(١٦) هیچ تەکانێك بە زمانت مەدە بۆ ئەوەی پەلەبکەیت بە خوێندنی ئەم قورئانە لەوکاتەی کە پێت دەوترێ واتە، ترسی لەبیرچونەوەت نەبێت.

(١٧) چونکە بەڕاستی ئێمە ئەو قورئانە کۆدەکەینەوەو بۆت دەخوێنینەوە.

(١٨) جا هەر کاتێك ئێمە خوێندمانەوە بۆت لەرێگای جبرەئیلەوە ئەوسا تۆیش بەدوای خوێندنەوەی ئەودا برۆو لەکاتی خوێندنیدا تەنها گوێ بگرەو بێدەنگ بە و قسە مەکە. ئەمەش ئامۆژگارییەکی بەنرخە بۆراهێنانی قوتابی لەکاتی وانەوتنەوەی مامۆستایدا. ئینجا دەفەرموێ:

(١٩) پاشان شیکردنەوەو ڕۆشنکردنەوەی لەسەر ئێمەیەو ترسی لەبیرچونەوەت نەبێت، ئەم چەند ئایەتە بەقسەی لابەلا (المعترضة) حیسابەو بۆنەی زۆر وتراوە لە تەفسیرەکاندا، بەڵام من پێم وایە پێویست بەو دوور ڕۆیشتنە نیە، چونکە پێغەمبەرمان ﷺکە ئەم سورەتەی تا ئەو ئایەتە بەهۆی جبرەئیلەوە بۆ خوێنراوەتەوە زۆر سوربوە بۆلەبەر کردنی‌و هەر لەگەڵ خوێندنی ئەودا (وەکو باسمان کرد) خوێندویەتی خودایش بەو چەند ئایەتانە ئامۆژگاری کردوەو ئەو ترسەی لەسەر دڵی لابردوە، پاشان چوەتەوە سەر مەبەستەکە کە باسی پاشەڕۆژە کە یەکێکە لە سێ بناغە بنەڕەتیەکەی ئیسلام (الْمَبْدَأ وَالنُّبُوَّة وَالْمِيعَاد /سەرەتاو پێغەمبەرایەتی‌و کۆتایی) لەڕاستیدا ماوەی سیانزە ساڵی پێغەمبەرمان ﷺ بە چەسپاندنی ئەو سێ شتەوە خەریك بوەو سورەتە مەکەییەکان بەزۆری هەر قسە لەسەر ئەو سێ بابەتە دەکەن‌و ئەم سورەتەش یەکێکە لەو سورەتە مەکەییانەو باسی قیامەت‌و پاشەڕۆژ دەکات (الْمِيعَاد) ، جا هەر چەند ئەوانە لاوازبن لەدڵی مرۆڤدا ئەوەندە ئەو مرۆڤە لەئایین دور دەکەوێتەوە، موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام لەسەر ئەو سێ بناغەیە پەروەردەبون بۆیە بەو ژمارە کەمەوە نەترسانە ئەوپەیامەیان بەبێ زیادو کەم بەجیهان گەیاندو توانای بەرپەرچدانەوەی هەمو هێرشێکی دوژمنیان هەبو نەك لەمردن ترسیان نەبو، بەڵکو بۆ مردن لەرێگای خودادا کێ بەرکێیان دەکرد، چونکە باوەڕیان بەو سێ بناغەیە باوەڕێکی ڕاست‌و بتەوو بەهێزبو، ئەوەبو پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێ باسی بەهەشتی دەکرد یەکێك لەیارانی ئامادەی ئەوە نەبو کە سێ دەنکە خورما تەواوبکات ئەوسا بچێتە مەیدانەوەبۆ شەهادەت، لەراستیدا پێچەوانەکەیشی پێچەوانەیە وەك ئەمڕۆ خۆمان زیاتر لە یەك ملیاردو نیوموسڵمان بێجگە لەسەر شۆڕی‌و داماوی خاوەنی چین؟ بەچکەی موسڵمانەو لەوانەشە نوێژ کەرو ڕۆژو گریش بێت دژی خواو ئایین‌و موسڵمانان ئیشی پێ دەکرێت‌و شانازیشی پێوە دەکات؟! ئەمە لەبەر ئەوەیە لەسەرەوە فێری ئایین بوەولەبناغەیەوە هیچ نازانێت‌و

كَلَّا بَلۡ تُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ ٱلۡأٓخِرَةَ ﴿٢١﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ﴿٢٣﴾ وَوُجُوهٞ يَوۡمَئِذِۭ بَاسِرَةٞ ﴿٢٤﴾ تَظُنُّ أَن يُفۡعَلَ بِهَا فَاقِرَةٞ ﴿٢٥﴾ كَلَّآ إِذَا بَلَغَتِ ٱلتَّرَاقِيَ ﴿٢٦﴾ وَقِيلَ مَنۡۜ رَاقٖ ﴿٢٧﴾ وَظَنَّ أَنَّهُ ٱلۡفِرَاقُ ﴿٢٨﴾ وَٱلۡتَفَّتِ ٱلسَّاقُ بِٱلسَّاقِ ﴿٢٩﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ يَوۡمَئِذٍ ٱلۡمَسَاقُ ﴿٣٠﴾ فَلَا صَدَّقَ وَلَا صَلَّىٰ ﴿٣١﴾ وَلَٰكِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٣٢﴾ ثُمَّ ذَهَبَ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ يَتَمَطَّىٰٓ ﴿٣٣﴾ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰ ﴿٣٤﴾ ثُمَّ أَوۡلَىٰ لَكَ فَأَوۡلَىٰٓ ﴿٣٥﴾ أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾ أَلَمۡ يَكُ نُطۡفَةٗ مِّن مَّنِيّٖ يُمۡنَىٰ ﴿٣٧﴾ ثُمَّ كَانَ عَلَقَةٗ فَخَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٣٨﴾ فَجَعَلَ مِنۡهُ ٱلزَّوۡجَيۡنِ ٱلذَّكَرَ وَٱلۡأُنثَىٰٓ ﴿٣٩﴾ أَلَيۡسَ ذَٰلِكَ بِقَٰدِرٍ عَلَىٰٓ أَن يُحۡـِۧيَ ٱلۡمَوۡتَىٰ ﴿٤٠﴾

## سُورَةُ الإِنسَانِ ٧٦ — ٣١

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ﴿١﴾ إِنَّا خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ مِن نُّطۡفَةٍ أَمۡشَاجٖ نَّبۡتَلِيهِ فَجَعَلۡنَٰهُ سَمِيعَۢا بَصِيرًا ﴿٢﴾ إِنَّا هَدَيۡنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرٗا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ سَلَٰسِلَاْ وَأَغۡلَٰلٗا وَسَعِيرًا ﴿٤﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ يَشۡرَبُونَ مِن كَأۡسٖ كَانَ مِزَاجُهَا كَافُورًا ﴿٥﴾

لەبەر خۆشی دنیاوەستبونی بەپلەو سامانەکەیەوە ئامادەیش نیە فێری ببێت! بەراستی موسیبەتێکی زۆر گەورەیە، جاوەرن گوێ لەخالقی خۆتان بگرن بزانن چی دەفەرموێ:

﴿٢٠﴾ بزانن، یان نەکەن، کاری وا بکەن پشت بکەنە قورئان، بەڵکوئێوە ئەودنیایەی کەبەپەلە لەدەستتان دەردەچێت ئەوەتان خۆشدەوێت‌وهەربەوەوە سەرگەرمن؛

﴿٢١﴾خۆ وازیشتان لە دوارۆژ هێناوەو ئیشی بۆناکەن کە هەر ئەوەش ماڵی ئایندەتانە!

﴿٢٢﴾ جا قیامەت کە هات، ئا لەو ڕۆژەدا کەسانێك هەن کە دەم‌وچاویان لەکەیف‌وشادمانیدا دەدرەوشێتەوە.

﴿٢٣﴾ چونکە ئەوانە لەو ڕۆژەدا تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن، لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {إنَّكُم سَتَرَونَ رَبَّكُم عَيَاناً/البخاری/ بێگومان ئێوە بەم زوانە بە ئاشکرا پەروەردگاری خۆتان دەبینن}واتە، لە ڕۆژی قیامەتدا. وە چەندین فەرمودەی تر هەیەکە هەرئایەتەکە خۆی‌و ئەم فەرمودەیە بەسە بۆ خاوەن باوەڕان.

﴿٢٤﴾ جا کەسانێکی تریش هەن کە دەم‌و چاویان مۆن‌و گرژە لەو ڕۆژەدا.

﴿٢٥﴾کە گومانی ئەوەش دەکەن کە سزای سەخت‌و پشت شکێنیان توش ببێت چونکە وەك وترا خۆیان چاك دەزانن چیان کێڵاوە.

﴿٢٦﴾ئەمانە هەر بیرناکەنەوە هەتا ئەو کاتەی کە مەرگ ناقیان دەگرێت‌و جوکەیان دەبڕێت.

﴿٢٧﴾جالەو کاتەدا دەبێژرێت: کێ هەیە نزاو دوعای بۆ بکات‌و یان کێ ئەم ڕۆحە بەرز دەکاتەوە؟ فریشتەی ڕەحمەت یان فریشتەی سزا؟ واتە لەو کاتەدا خزمانی نزیکی‌و ژیری تازە دەزانن ئەوە دەمرێت، باشترین قسەیان ئەوەیە کە بڵێن خوا ڕەحمی ئیمانی پێ بکات‌و فریشتەی ڕەحمەت گیانی دەرکات، چونکە هیچی تریان لە دەست نایەت بۆی لەو کاتەدا بێجگە لەوە، جا خوێنەری بەڕێز خۆت بخەرە ئەو کاتەوەو کەمێك لە پاشەڕۆژی خۆت وردببەرەوەو بزانە تۆ دەبێ لەکام یەك لەو دووبەشانە بیت.

﴿٢٨﴾بەهەناسەدانی و بەرەبینگە پێکەوتنی دڵنیا دەبێت کە بێگومان ئەمە ئیتر جیابونەوەیە لە کەس‌وکارو خۆشەویستان‌و سەروەت‌و سامانی، هەرچییەکی هەبو نەیدا دەرمانی، دەبێ هەر بڕوات بۆلای یەزدانی، خۆ ئەو کاتەش دێتە بەرچاوی باری تاوانی‌و لەبەرزانی مەرگ نیەتی وچانی، شەیتانیش ئەوکاتە خۆی پیشان دەداتوەك هاوزمانی‌و دەبێ بەدۆستی گیانی بەگیانی‌و پێی دەڵێ سوجدەیەکم بۆببە گەر بەچاویشبێ ئەوسەختیەت دەڕواو دەکەویتە ئاسانی، خۆ ئەگەر وای کرد ئیتر ئەوەیە سەلبی ئیمانی، خواپەنامان بدات.

﴿٢٩﴾ جا کابرای گیان گەیشتو بەگەرو، قاچەکانی بە دەوری یەکدا بادەخۆن چونکە تازە گیانی تێدا نەماوەو شل‌و خاودەبنەوە.

﴿٣٠﴾ئەو ڕۆژە هەر بەرەو خوایە جێگای پاڵپێوەنانت خۆ متکردن‌و جێگای خۆ دزینەوەت نیە،

﴿٣١﴾چونکە هەرگیز نەباوەڕی بوەو نە نوێژیشی کردوە. واتە، نە کرداری دڵی بوەو نە کرداری لەشی‌و هیچ چاکەیەکی نەبوە نە بەنهێنی‌و نە بە ئاشکرا.

﴿٣٢﴾ نەك هەر ئەوە بەڵکو وتویەتی هاتنی قیامەتیش درۆیەو گوێی پێنەداوەو پشتی تێکردوە.

(٣٣) پاشان بە لارەولەنجەو خۆبادانەوە چوەتە لای خاوخێزانی لە دنیاداو پاشەڕۆژو حیسابو تۆڵەی بەڕاست نەدەزانی، ئینجا پەروەردگار ڕوی سەرزەنشتی تێدەکاتو دەفەرموێ:

(٣٤) بەڵێ شایستەیە بۆ تۆ ئاوا لە خۆت بایی ببیتو باوەڕ بە دروستکەری خۆت نەکەیت؛ سا هەرئەوە باشە بۆت؛

(٣٥) پاشان هەر ئەوە شایستەی تۆیە، سا هەرئەوە باشە بۆت؛ بەڕاستی ئەمە هەڕەشەیەکی زۆر توندە لەلایەن خالیقی مرۆڤەوە بۆ ئەو مرۆڤە بێباوەڕو نمەك نەناسو سپڵەیانە کە ڕێزی پەروەردگاری خۆیان ناگرنو بەندایەتی بۆ ناکەن، ئینجا دەفەرموێ:

(٣٦) ئایا ئەم مرۆڤە خوانەناسە پێی وایە هەر بە بێهودەیەو وازی لێ هێنراوە کە چی دەکات بیکاتو چۆنی پێخۆشە وەها بکاتو بەر حیسابو سزا ناکەوێت؟ جا ئەوخودایەی کە دانایە چۆن ئیشی بێسودی وادەکات؟

(٣٧) ئایا ئەوکەسە دڵۆپەیەك شەهوەت نەبوە کە فڕەدراوەتە ناو ڕەحمی دایکەوە؟

(٣٨) پاشان بوەتە خوێنێکی مەیو ئەوسا دروستیکرد، ئینجا ڕێکوپێکی کرد؟

(٣٩) جا لەوەش کردنی بە جوت نێرو مێ؟

(٤٠) ئایا زاتی ئاوەها ناتوانێت مردوان زیندو بکاتەوە؟ پیغەمبەرمان ﷺ هەرکات ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە دەیفەرمو: {سُبحَانَكَ فَبَلَى/ ابوداود، صححه الألباني/ واتە پاکو بێگەردی هەر بۆتۆیە جا چۆن ناتوانیت} بێگومانە کە مردو زیندوکردنەوە ئاسانترە لەو دروستکردنەی سەرەتا، دەی ئەگەر خۆت بە ڕۆشنبیرو لێزان دەزانیتو ئاگات لە سەرەتای دروستبونی خۆت هەیە ئیتر بۆچی دەبێت لە زیندوکردنەوەی دووبارە دوودڵ بیت؟ ئایا پێت وایە ئەو پەروەردگارەی کە دروستی کردویت ناتوانێت پاش مردن زیندوت بکاتەوە؟ جا پڕ بەدڵ بڵێ: سُبْحَانَكَ فَبَلَى.

## (٧٦) سورەتی ئینسان (٣١)

سورەتی ئینسان کە سورەتی حەفتاو شەشهەمی قورئانە، زۆربەی ڕاڤەکاران بەلایانەوە وایە کە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، سیو یەك ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین نەوەدو هەشتەمین سورەتەو پاش سورەتی (الرحمان) و پێش ( الطلاق) دابەزیوە، سورەتی (هل أتى)و(الدهر) یشی پێدەوترێت.

عەبدوڵای کوڕی عەباسو موقاتیلو کەلبی دەڵێن: لە مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە، ئیمامی مسلم هێناویەتی کە پێغەمبەری خودا ﷺ: لە نوێژی بەیانی ڕۆژی جومعەدا لە ڕکاتی یەکەمدا (الم، تنزیل) سەجدەو لە ڕکاتی دووهەمدا ﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ﴾ ی خوێندوە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بێگومان بەسەر مرۆڤدا ماوەیەك لەم ڕۆژگارە تێپەڕیوە کە ئەو شتێکی وانەبوە کەباسکرێت، لەبەر سوکیو لاوازی ئەم مرۆڤە، سەرەتا لە خاكو قوڕو قوڕی مەچو و قوڕی وشك بوی وەکو: گۆزەو پاشان گیانی تێکراو ڕێزی لێنراو جارێکی تر ﷲ دروستکردنی مرۆڤی گواستەوە بۆ شێوەیەکی تر وەکو دەفەرموێ:

(٢) بێگومان ئێمە (پاش ئادەم) ئەم مرۆڤەمان دروستکرد لە دڵۆپەیەك ئاوی شەهوەتی تێکەڵاو لەئاوی پیاو و ئافرەت لە ڕەحمی ئافرەتدا، کەتاقی دەکەینەوە، جا کردومانە بە مرۆڤێکی بیسەرو بینەر تا ئایەتەکانی ئێمە ببیسێتو نیشانەکانی ئێمەی چاو پێبکەوێتو بە ئارەزۆی خۆی ڕێگای چاك یان خراپ بگرێت، تا لە ڕۆژی دواییدا هیچ بەهانەیەکی نەبێت .

(٣) بێگومان کە ئێمە ڕێگای ڕاستمان پیشانداوە، جا یان سوپاسگوزارو پەیڕەویکەری ڕێگای ڕاستە یان سپڵەو پێنەزانە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەکەعبی کوڕی عوجرەی فەرمو: { أُعِيذُكَ بِاللَّهِ يَا كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ مِنْ أُمَرَاءَ يَكُونُونَ مِنْ بَعْدِي فَمَنْ غَشِيَ أَبْوَابَهُمْ فَصَدَّقَهُمْ فِي كَذِبِهِمْ وَأَعَانَهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَلَيْسَ مِنِّي وَلَسْتُ مِنْهُ وَلَا يَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ وَمَنْ غَشِيَ أَبْوَابَهُمْ أَوْ لَمْ يَغْشَ فَلَمْ يُصَدِّقْهُمْ فِي كَذِبِهِمْ وَلَمْ يُعِنْهُمْ عَلَى ظُلْمِهِمْ فَهُوَ مِنِّي وَأَنَا مِنْهُ وَسَيَرِدُ عَلَيَّ الْحَوْضَ يَا كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ الصَّلَاةُ بُرْهَانٌ وَالصَّوْمُ جُنَّةٌ حَصِينَةٌ وَالصَّدَقَةُ تُطْفِئُ الْخَطِيئَةَ كَمَا يُطْفِئُ الْمَاءُ النَّارَ يَا كَعْبَ بْنَ عُجْرَةَ إِنَّهُ لَا يَرْبُو لَحْمٌ نَبَتَ مِنْ سُحْتٍ إِلَّا كَانَتْ النَّارُ أَوْلَى بِهِ /الترمذی. صححه الالبانی/ لەخوا بۆت داوادەکەم کە لەخراپی ئەمیرانێك بتپارێزێت کەلەپاش من دێن ، ئەوسا هەرکەسێك بچێتە لایانوباوەڕ بکات بە درۆکانیان و یارمەتیان بدات لەسەرستەمەکانیان، ئەوسا ئەوە لەمن نیەو منیش لەونیم لەسەر حەوز نایەتەلام، ئەوسا هەرکەسێك بچێتە لایان یان هەر نەچێتە لایانو باوەڕ نەکات بە درۆکانیانویارمەتیان نەدات لەسەرستەمەکانیان، سا ئەوە لەمنە و منیش لەئەو، بەمزوانەش لەسەر حەوز دێتەلام، ئەی کەعبی کوڕی عوجرە نوێژ بەڵگەیەو ڕۆژو سپێرێکی پارێزەرەو چاکە تاوانەکان ڕەش دەکاتەوە هەروەك چۆن ئاو ئاگر دەکوژێنێتەوە، ئەی کەعبی کوڕی عوجرە هەر گۆشتێك بەحەرام گەورەببێت ئاگر شایستە ترە پێی}

عَيۡنٗا يَشۡرَبُ بِهَا عِبَادُ ٱللَّهِ يُفَجِّرُونَهَا تَفۡجِيرٗا ﴿٦﴾ يُوفُونَ بِٱلنَّذۡرِ وَيَخَافُونَ يَوۡمٗا كَانَ شَرُّهُۥ مُسۡتَطِيرٗا ﴿٧﴾ وَيُطۡعِمُونَ ٱلطَّعَامَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ مِسۡكِينٗا وَيَتِيمٗا وَأَسِيرًا ﴿٨﴾ إِنَّمَا نُطۡعِمُكُمۡ لِوَجۡهِ ٱللَّهِ لَا نُرِيدُ مِنكُمۡ جَزَآءٗ وَلَا شُكُورًا ﴿٩﴾ إِنَّا نَخَافُ مِن رَّبِّنَا يَوۡمًا عَبُوسٗا قَمۡطَرِيرٗا ﴿١٠﴾ فَوَقَىٰهُمُ ٱللَّهُ شَرَّ ذَٰلِكَ ٱلۡيَوۡمِ وَلَقَّىٰهُمۡ نَضۡرَةٗ وَسُرُورٗا ﴿١١﴾ وَجَزَىٰهُم بِمَا صَبَرُواْ جَنَّةٗ وَحَرِيرٗا ﴿١٢﴾ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِۖ لَا يَرَوۡنَ فِيهَا شَمۡسٗا وَلَا زَمۡهَرِيرٗا ﴿١٣﴾ وَدَانِيَةً عَلَيۡهِمۡ ظِلَٰلُهَا وَذُلِّلَتۡ قُطُوفُهَا تَذۡلِيلٗا ﴿١٤﴾ وَيُطَافُ عَلَيۡهِم بِـَٔانِيَةٖ مِّن فِضَّةٖ وَأَكۡوَابٖ كَانَتۡ قَوَارِيرَا۠ ﴿١٥﴾ قَوَارِيرَاْ مِن فِضَّةٖ قَدَّرُوهَا تَقۡدِيرٗا ﴿١٦﴾ وَيُسۡقَوۡنَ فِيهَا كَأۡسٗا كَانَ مِزَاجُهَا زَنجَبِيلًا ﴿١٧﴾ عَيۡنٗا فِيهَا تُسَمَّىٰ سَلۡسَبِيلٗا ﴿١٨﴾ ۞ وَيَطُوفُ عَلَيۡهِمۡ وِلۡدَٰنٞ مُّخَلَّدُونَ إِذَا رَأَيۡتَهُمۡ حَسِبۡتَهُمۡ لُؤۡلُؤٗا مَّنثُورٗا ﴿١٩﴾ وَإِذَا رَأَيۡتَ ثَمَّ رَأَيۡتَ نَعِيمٗا وَمُلۡكٗا كَبِيرًا ﴿٢٠﴾ عَٰلِيَهُمۡ ثِيَابُ سُندُسٍ خُضۡرٞ وَإِسۡتَبۡرَقٞۖ وَحُلُّوٓاْ أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٖ وَسَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ شَرَابٗا طَهُورًا ﴿٢١﴾ إِنَّ هَٰذَا كَانَ لَكُمۡ جَزَآءٗ وَكَانَ سَعۡيُكُم مَّشۡكُورًا ﴿٢٢﴾ إِنَّا نَحۡنُ نَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡقُرۡءَانَ تَنزِيلٗا ﴿٢٣﴾ فَٱصۡبِرۡ لِحُكۡمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعۡ مِنۡهُمۡ ءَاثِمًا أَوۡ كَفُورٗا ﴿٢٤﴾ وَٱذۡكُرِ ٱسۡمَ رَبِّكَ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلٗا ﴿٢٥﴾

وه لەریواتی تری ئەم فەرمودەدا هاتوەکە:{ لِكَعْبِ بْنِ عُجْرَةَ أَعَاذَكَ اللَّهُ مِنْ إِمَارَةِ السُّفَهَاءِ قَالَ وَمَا إِمَارَةُ السُّفَهَاءِ قَالَ أُمَرَاءُ يَكُونُونَ بَعْدِي لَا يَقْتَدُونَ بِهَدْيِي وَلَا يَسْتَنُّونَ بِسُنَّتِي .... يَا كَعْبُ بْنَ عُجْرَةَ النَّاسُ غَادِيَانِ فَمُبْتَاعٌ نَفْسَهُ فَمُعْتِقُهَا وَبَائِعٌ نَفْسَهُ فَمُوبِقُهَا /أحمد، صحيح لغيره: الألباني / ئەی کەعبی کوڕی عوجرە داوای پەنات بۆدەکەم لە خوا لەئەمیرایەتی نەفامەکان وتی: کامەیە ئەمیرایەتی نەفامەکان؟ فەرموی: ئەمیرانێکن کەلەپاش من پەیدا دەبن نەپەیرەوی ڕێنماییەکانم دەکەن‌و نە ڕێ‌و شوێنی من دەگرن....(وەك پێشوایە تا) ئەی کەعبی کوڕی عوجرە هەمو مرۆڤێك کە ڕۆژ دەکاتەوە ئەوسا فرۆشەری نەفسی خۆیەتی جا یان دوچاری سزای دەکات یان لە سزا ڕزگاری دەکات}

﴿٤﴾ بێگومان ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ خوانەناسان زنجیرگەلی پێون کردنیان‌و تەوقەگەلی دەست‌و مل بەستنیان‌و ئاگری بڵێسەدار.

﴿٥﴾ بە بێگومان کە چاکەکاران بەپیاڵەی پڕ لە شەراب دەخۆنەوە کە کافوری تێکەڵاوە،

﴿٦﴾ کە چاوگەیەکە کە بەندە شایستەکانی ﷲ لەوێدا دەیخۆنەوەو بۆ هەر جێگایەك کە مەبەستیانە لە ماڵ‌و کۆشك‌و کۆڕیان دەیبەن‌و بەکەیفی خۆیانە لەکوێ‌و چۆن‌و چەندیان بیەوێت وای لێدەکەن، جا پەروەردگار وەسفی ئەو بەندە چاکانەی خۆیمان بۆ دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٧﴾ ئەوانە ئەو کەسانەن کەهەر شتێك لەسەر خۆیان دادەنێن جێ بەجێی دەکەن‌و لە ڕۆژێك دەترسن کە سەختی‌و دژواریەکەی هەمو لایەك دەگرێتەوە.

خاتون عائیشەی دایکی باوەڕداران (خوا لێی ڕازی بێت) هێناویەتی لە پێغەمبەری خواوە ﷺکەفەرمویەتی: {مَن نَذَرَ أن يُطيعِ اللهَ فَلْيُطِعهُ، وَمَن نَذَرَ أَن يَعصِيَ اللهَ فَلا يَعْصِهِ /البخاری/ هەر کەسێك لەسەرخۆی دانا کە بەندایەتی خودا بکات با بەندایەتی خودا بکات‌و نەزرەکەی خۆی بداتە سەر، وە هەر کەسێکیش لەسەرخۆی پێویست کردوە کە نافەرمانی ﷲبکات قسەکەی خۆی نەباتە سەروبێ فرمانی ﷲ نەکات}. جا پەروەردگارمان درێژە بە وەسفی بەندە چاکەکانی خۆی دەدات‌و دەفەرموێ:

﴿٨﴾ جا ئەوانە کەسانێکن کە لەو خواردنەی خۆیان حەزیان لێیەتی بەشی کەمدەست‌و هەتیو و گیراو دەدەن.

﴿٩﴾ جا دەڵێن: ئێمە هەر لەبەر خاتری ڕەزامەندی ﷲ خواردنتان پێدەدەین، لە ئێوەوە پاداشت‌و سوپاسمان ناوێت. موجاهیدو سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێن: بە خوا بەدەم ئەم قسەیان نەدەکرد، بەڵام خوا دەیزانی بەناو دڵیان جا سوپاسی کردون لەسەر ئەو کارە جوانانەیان تا زیاتر سوربن لەسەر شتی چاك‌و مرۆڤدۆستی، دیارە کاتی دابەزینی ئەم ئایەتە موسڵمانەکان ئەسیریان لە ژێر دەستدا نەبوە کەوابو ئەم چاکەیە کە ئەم پیاو چاکانە کردویانە بەرامبەر بە ئەسیری کافر بوە، جا ئەمەیە سروشتی چاکە کردن‌و مرۆڤدۆستی لە ئیسلامدا کەچاکەیان لەگەل دوژمنانی خۆیاندا کردوە، ئەمرۆ موسڵمان برای موسڵمانی خۆی دەگرێت‌و هەموجۆرە ئازارێکی دەدات لەوانەش برسی کردن؟! جا ئەو پیاو چاکانە دەیانگوت:

﴿١٠﴾بێگومان ئێمە لە پەروەردگاری خۆمان دەترسین لە ڕۆژێك کە زۆر مۆن‌و پرغەم‌و پەژارەیە بەڵکو ڕزگارمان بکات.

﴿١١﴾ جا ﷲ لە خراپەی ئەو ڕۆژە پاراستنی وە بە شادی‌و خۆشیەوە هات بەدەمیانەوەو پاداشتی دانەوە.

﴿١٢﴾ جا بەهۆی خۆڕاگریانەوە بە باخچەو پۆشاك‌و ڕایەخی هەورێشم پاداشتی دانەوە،

﴿١٣﴾لەناویدا لەسەر تەختەکان شانیان داداوەو چاویان ناکەوێت نە بەگەرمایی خۆرو نە بەسەرمایی وەك زستان ، بەڵکو کاتێکی

مام ناوەندە نە گەرمەو نە ساردەو ڕوناکیەکەیشی وەکو کاتی ڕوناکی بەیانیە تا خۆر دەردەکەوێت.

(١٤) سێبەری درەختەکانی ئەو باخچەیە هەمیشە نزیکە لێیانەوەو میوەکانیشی ڕامو گەردنکەچ کراون چۆن گەردن کەچێك، هەرچۆنێك بن بە پێوە یان دانیشتن یان ڕاکشان هەرکە ئارەزۆی میوە بکەن دێتە بەر دەستیانو تەنها لێکردنەوەو خواردنی ئەرکی سەرشانیانەو هیچی تر، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ أَهْلَ الجَنَّةِ يَأْكُلُونَ مِنْ ثِمَارِ الجَنَّةِ قِيَامًا وَقُعُودًا وَمُضْطَجِعِينَ/ البيهقي، الألباني: صحيح لغيره/ خەڵکی بەهەشتی لەمیوەکانی دەخۆنەوە بەپێوەو بەدانیشتویو بەراکشاوی}.

(١٥) جا بەناویاندا دێتو دەبرێت دەفرانێکی زیویو گۆزەی بێدەستو لولە هەروەکو شوشە وان لە دەرەوە ناویان دەبینرێت،

(١٦) دەفرانێکن لە زیو بە ئەندازەی پێویست بێ زیادو کەم ئامادەکراون.

(١٧) لەناو ئەو باخچەدا شەرابیان پێدەردێت بە پیاڵەیەك کە زەنجەفیلی تێکەڵە،

(١٨) کە چاوگەیەکە لەناویدایەو پێی دەوترێت: سەلسەبیل.

(١٩) مندالانێك کە هەمیشە هەر مندالن (کە بۆ خزمەتکردن دانراون) بەناویاندا دەگەڕێن، هەر کاتێك بیان بینی وادەزانی مروارین پرژێنراون ئەوەندە پاكو خاوێنو سپیو جوانن. ئەی مرۆڤی ژیر پەروەردگارت ئا ئەوەی بۆ ئامادەکردویت، بۆچی ئەوەندە بەم دنیا کۆتاو پڕ لەدەردەسەرییە سەرگەرمیتو بۆ ئەو دنیا هەمیشەییو پڕ نازو نیعمەتە کێبەرکێ ناکەیت؟!

(٢٠) جا هەر کاتێك ئا ئەو جێگایەت بینی چاوت بە نازو نیعمەتی فرەوانو موڵکێکی گەورە دەکەوێت.

(٢١) جا بە پۆشاکی تانو پۆ هەورێشمی سەوزو ناسك بۆ ژێرەوەو قایم بۆ سەرەوە خۆیان پۆشیوەو بە دەستبەندی زیو ڕازێنراونەتەوەو پەروەردگاریان شەرابی پاكو خاوێنیان پێ دەدات، نەك وەکو شەرابە بۆگەنەکەی دنیا کە زۆرێك لە نەزانان خۆیانی پێ بێهۆشو سووك دەکەنو خۆیان لەو شەرابە پاکە بێبەری دەکەن، ئینجا پێیان دەفەرموێ:
بێبەری دەکەن، ئینجا پێیان دەفەرموێ:

(٢٢) بێگومان ئەمە پاداشتی کارە چاکەکانی ئێوەیەو کارو کۆششتان ڕێزلێگیراوو سوپاسکراوە. لە فەرموودەی سەحیحدا هاتووە کە خوای گەورە بە ئاخر کەسێك لە ئاگر دەردەچێتو ئاخر کەسێکە کە دەچێتە بەهەشتەوە دەفەرموێ:{إِنَّ لَكَ مِثْلَ الدُّنيَا وَعَشَرَةُ أمثَالِهَا/البخاري/ بێگومان بۆ تۆیە بە ئەندازەی دنیاو دە بەرانبەریشی} جا ئەمە بەشی ئاخر کەس بێت دەبێت بەشی مام ناوەندەکانو سەرەتاییەکان چەند بێت؟ تا ئێرە باسی پاشەڕۆژ بو (الْمِعَاد) ئینجا دەێتەوە سەر باسی پێغەمبەرایەتیو ناسینی خواو یادکرنی بەکورتی (الْمَبدَأوالنُّبُوَّة)و دەفەرموێ:

(٢٣) بێگومان ئێمە ئەم قورئانەمان ناردوەتە سەر تۆ بە ناردنێکی ڕێكوپێكو هێواش هێواش.

(٢٤) سا تۆیش بۆ فەرمانی پەروەردگارت خۆگربەو بە گوێی هیچکام لەوانە نەکەیت نە گوناهکاریانو نە خوانەناسیان. تۆ بەردەوام بە لەسەر گەیاندنی پەیامەکەتو دڵت هەر لای ئێمە بێت.

(٢٥) یادی ناوی پەروەردگاری خۆت بکە بە بەیانیانو بە ئێواران.

(٢٦) وە لە بەشێکی شەودا ئەوسا بەندایەتی ئەوزاتە بکەوسوجدەی بۆ ببەو تەسبیحاتی ئەو زاتە بکە لە شەوە درێژەکاندا ، دەگونجێت مەبەست نوێژکردن بێت وە ئەمە هەر پێنج کاتەکە دەگرێتەوە واتە هەموکاتێك خوای خۆتت لەبیر نەچێت.

(٢٧) بێگومان کە ئەوانە دنیایان خۆش دەوێتو وازیان لە ڕۆژی زۆر سەختو گران کە قیامەتە هێناوەو خستویانە پاش گوێیانەوە.

(٢٨) ئێمە دروستمان کردنو هەمو سەرجەمسەرەکانی لەشیانمان بە توندی بەست بەیەکەوەو بتەومان کردنو هەر کاتێکیش ئارەزۆمان لێ بێت دەیانگۆڕینەوە بە کەسانێکی وەکو خۆیانو ئەوان لەناو دەبەین، واتە ژیانتان ئەمانەتێکەو هەر کاتێك ویستمان لێتان وەردەگرینەوەو تا دنیایش ماوە هەر خەڵکی تری

وَمِنَ ٱلَّيۡلِ فَٱسۡجُدۡ لَهُۥ وَسَبِّحۡهُ لَيۡلٗا طَوِيلًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ يُحِبُّونَ ٱلۡعَاجِلَةَ وَيَذَرُونَ وَرَآءَهُمۡ يَوۡمٗا ثَقِيلٗا ﴿٢٧﴾ نَّحۡنُ خَلَقۡنَٰهُمۡ وَشَدَدۡنَآ أَسۡرَهُمۡۖ وَإِذَا شِئۡنَا بَدَّلۡنَآ أَمۡثَٰلَهُمۡ تَبۡدِيلًا ﴿٢٨﴾ إِنَّ هَٰذِهِۦ تَذۡكِرَةٞۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلٗا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿٣٠﴾ يُدۡخِلُ مَن يَشَآءُ فِي رَحۡمَتِهِۦۚ وَٱلظَّٰلِمِينَ أَعَدَّ لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمَۢا ﴿٣١﴾

## سُورَةُ المُرسَلَات ٧٧ ٥٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡمُرۡسَلَٰتِ عُرۡفٗا ﴿١﴾ فَٱلۡعَٰصِفَٰتِ عَصۡفٗا ﴿٢﴾ وَٱلنَّٰشِرَٰتِ نَشۡرٗا ﴿٣﴾ فَٱلۡفَٰرِقَٰتِ فَرۡقٗا ﴿٤﴾ فَٱلۡمُلۡقِيَٰتِ ذِكۡرًا ﴿٥﴾ عُذۡرًا أَوۡ نُذۡرًا ﴿٦﴾ إِنَّمَا تُوعَدُونَ لَوَٰقِعٞ ﴿٧﴾ فَإِذَا ٱلنُّجُومُ طُمِسَتۡ ﴿٨﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ فُرِجَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ نُسِفَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلرُّسُلُ أُقِّتَتۡ ﴿١١﴾ لِأَيِّ يَوۡمٍ أُجِّلَتۡ ﴿١٢﴾ لِيَوۡمِ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٣﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلۡفَصۡلِ ﴿١٤﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٥﴾ أَلَمۡ نُهۡلِكِ ٱلۡأَوَّلِينَ ﴿١٦﴾ ثُمَّ نُتۡبِعُهُمُ ٱلۡأٓخِرِينَ ﴿١٧﴾ كَذَٰلِكَ نَفۡعَلُ بِٱلۡمُجۡرِمِينَ ﴿١٨﴾ وَيۡلٞ يَوۡمَئِذٖ لِّلۡمُكَذِّبِينَ ﴿١٩﴾

بۆ دروست دەكەین ، ئیتر بۆچی ئەوەندە دنیاتان خۆش دەوێت كەدڵنیان بەجێی دەهێڵن‌و قیامەتتان ناوێت كە بۆی دەچن‌و هەرگیز نایشتوانن ڕێگا بەم گۆڕانكاریەی پەروەردگارتان بگرن.

﴿٢٩﴾ بێگومان كە ئەم سورەتە ئامۆژگاریە جا هەر كەسێك ئارەزۆی لێیە با بەرەو پەروەردگاری خۆی ڕێگا بگرێتە بەرو واز لە گوناح و خراپەكاری بهێنێت.

﴿٣٠﴾ئەوسا ئارەزۆیش ناكەن مەگەر هەر ئەوەی كە اللّٰه دیەوێت (كەواتە دەبێ زۆر لە خوا بترسن‌و بەگەردن كەچییەوەداوای یارمەتی لێ بكەن كە یارمەتیتان بدات بۆ گەیشتن بە خۆشبەختی دنیاو قیامەت) بێگومان خودا زاناو كار بەجێیە،

﴿٣١﴾ ئارەزۆی لە هەر كەسێك بێت دەیخاتە ناو نازو نیعمەتی خۆی‌وخۆشبەختی دەكات، جا ئامادەی كردوە بۆ ستەمكارانیش سزایەكی گەورەو بەژان، سا مرۆڤ ئەگەر ژیر بێت تا بتوانێ دەبێ شەوو ڕۆژ لە خوا بپاڕێتەوە كە ڕێنمایی بكات‌و بیگەیەنێت بە خۆشبەختی هەردوو دنیا، چونكە كاتێك كە مرد هەموو شتێكی لەدەست دەردەچێت‌و چی كێڵابێت ئەوسا هەر ئەوە دروێنە دەكات، چاك یان خراپ. ئەبوزەر دەڵێت: پێغەمبەرﷺ ئەم سورەتەی خوێندەوە تا تەواوی كرد جا فەرمویː { إِنِّي أَرَى مَا لَا تَرَوْنَ وَأَسْمَعُ مَا لَا تَسْمَعُونَ أَطَّتْ السَّمَاءُ وَحُقَّ لَهَا أَنْ تَئِطَّ مَا فِيهَا مَوْضِعُ أَرْبَعِ أَصَابِعَ إِلَّا وَمَلَكٌ وَاضِعٌ جَبْهَتَهُ سَاجِدًا لِلَّهِ وَاللَّهِ لَوْ تَعْلَمُونَ مَا أَعْلَمُ لَضَحِكْتُمْ قَلِيلًا وَلَبَكَيْتُمْ كَثِيرًا وَمَا تَلَذَّذْتُمْ بِالنِّسَاءِ عَلَى الْفُرُشِ وَلَخَرَجْتُمْ إِلَى الصُّعُدَاتِ تَجْأَرُونَ إِلَى اللَّهِ لَوَدِدْتُ أَنِّي كُنْتُ شَجَرَةً تُعْضَدُ /الترمذي إلا أنه قال ما فيها موضع أربع أصابع، حسنه الألباني/ بێگومان من شتێك دەبینم كەئێوە نایبینن و شتێك دەبیسم كە ئێوە نایبیسن، ئاسمان چركە چركی دێت‌و ماڤی خۆیشێتی كەئەو چركە چركەی لێ بێت چونكە جێگای چوار ئەنگوشتی نیە مەگەر فریشتەیەك بەسوجدە بردن بۆ خوا ناوچاوی لەسەر دانابێت، بەاللّٰه قەسەم ئەگەر بزانن ئەوەی كەمن دەیزانم كەم پێدەكەنن‌و زۆر دەگرین‌و خۆشی وەرناگرن لەژنان لەسەر فەرشەكاندا و دەر دەچون بۆ بەرزاییەكان لەاللّٰه دەپاڕانەوە. ئەبوزەر دەڵێت: بەراستی ئاواتم خواست كە درەختێك بومایە كە بخورامایە و كۆتایم پێ بهاتایە}

## ٧٧ سورەتی مورسەلات ٥٠

سورەتی مورسەلات یان (والمورسلات) كە حەفتاو حەوتەمین سورەتی قورئانە، لە مەككدا هاتوەتە خوارەوەو پەنجا ئایەتە.

ئومی فەزڵی كچی حاریس دەڵێت: { صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي بَيْتِهِ الْمَغْرِبَ فَقَرَأَ الْمُرْسَلَاتِ مَا صَلَّى بَعْدَهَا صَلَاةً حَتَّى قُبِضَ ﷺ/ النسائي، صححه الألباني/ پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی مەغریبی بۆكردین لەماڵی خۆیدا ، جا مورسەلاتی خوێند كە پاش ئەوە نوێژی نەكرد هەتا وەفاتی كرد}

بەگوێرەی دابەزین سی‌و سێ هەمین سورەتە،واتەلەو سورەتانەیە كە لە سەرەتای هاتنی پێغەمبەرەوە ﷺ كە هێشتا بانگەوازی ئیسلام هەر بە نهێنی بووە ،لە شەوێكدا كە وتراوە شەوی عەرفە بوە لە ئەشكەوتێك لە مینادا ئەم سورەتە دابەزیوە،

عەبدوڵای كوڕی مەسعود دەڵێت: { بَيْنَمَا نَحْنُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَارٍ بِمِنًى إِذْ نَزَلَ عَلَيْهِ وَالْمُرْسَلَاتِ وَإِنَّهُ لَيَتْلُوهَا وَإِنِّي لَأَتَلَقَّاهَا مِنْ فِيهِ وَإِنَّ فَاهُ لَرَطْبٌ بِهَا /متفق عليه/ كاتێك كەئێمە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ بوین لە ئەشكەوتێكی مینادا ئا لەودەمەدا وەلورسەلاتی بۆ هات‌و ئەودەیخوێندەوەوبەراستی منیش لەدەمی خۆیەوە وەرم گرت هێشتا دەمی تەربو بەوسورەتە}

بەناویاللّٰهی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ سوێند بەوانەی یەك لەپاش یەك ڕەوانە دەكرێن، فریشتە، یان پێغەمبەران كە یەكەمیان نزیكترە.

﴿٢﴾ جا بەو بایانەی كە بە توندی هەڵدەكەن‌و دەنگیان لێ دێت‌و بەچاو نابینرێن‌و دارو درەختان دەشكێنن. دایكی باوەڕداران عایشە دەڵێت: هەركات بایەكی توند دەهات پێغەمبەر ﷺدەیفەرمو: {اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ خَيْرَهَا وَخَيْرَ مَا فِيهَا وَخَيْرَ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهَا وَشَرِّ مَا فِيهَا وَشَرِّ مَا أُرْسِلَتْ بِهِ /مسلم وغيره/

ئەی خوایە داوای چاکەی ئەم بایەت لێ دەکەم وەچاکەی ئەوشتەش کە تێیدایەوچاکەی ئەوەش کەبۆی رەوانە کراوە، وەپەنادەگرم بەتۆ لەخراپی ئەم بایەو خراپی ئەوشتەش کە تێیدایەوخراپی ئەوەش کەبۆی رەوانە کراوە}

(٣) جا سوێند بەوانەیش کە بڵاودەکەنەوە هەورەکان بە بڵاوکردنەوەو بە فەرمانی خوا دەیبەن بۆ جێگای مەبەستو هەندێك جاریش هەورەکە گاڵ گاڵ دەکەنو دەیڕەوێننەوە.

(٤) سا سوێند بەو فریشتانەش کە فەرمانی خودا دادەبەزێننو ڕاستو ناڕاست لەیەك جیادەکەنەوە

(٥) جا سوێند بەو فریشتانەش کە دەیگەیەنن بە پێغەمبەران بە بێ دەستکاری ئەو پەیامەی کە پێویستە پێیان بگات.

(٦) بۆ نەهێشتنی بەهانە یان بۆ ترساندنی ستەمکاران، خوا ئەم پێنج سوێندەی خوارد کە،

(٧) بێگومان ئەوەی کە بەڵێنتان پێدراوە ڕوودەدات واتە : قیامەت دێتو لێپێچینەوەتان لەگەڵدا دەکرێت.

(٨) جا ئەو کاتەی کە ئەستێرەکان کوژانەوە.

(٩) وە ئەو کاتەی کە ئاسمان کەلێنی تێکراو لەتکرا .

(١٠) وە ئەو کاتەی کە چیاکان لەناوبرانو هیچ شوێنەوارێکیان نەما.

(١١) وە هەر کاتێك پێغەمبەران کاتیان بۆ دیاری کراو دواخران.

(١٢) بۆ کام ڕۆژ ئەو پێغەمبەرانە دواخران؟

(١٣) بۆ ڕۆژی جیاکردنەوە دواخران، ئینجا دەفەرموێ:

(١٤) تۆ چوزانی ڕۆژی جیاکردنەوە چیە؟ لێرەدا باسی ڕۆشنکردنەوەی ڕۆژەکە ناکات ، بەڵکو باسی بەسەرهاتی خەڵك دەکات لەو ڕۆژەداو دەفەرموێ:

(١٥) وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان، جا بەمە کۆتایی بە باسی ئەو خەڵکەی ڕۆژی جیاکردنەوە دەهێنێتو سرنجی خەڵکی دنیا ڕادەکێشێت بۆ ئەو بێباوەڕانەی پێش خۆیان بەڵکو ئەمانیش لەوە پەندوەرگرنو دەفەرموێ:

(١٦) ئایا ئێمە مرۆڤە خوانەناسەکانی پێشومان لەناونەبردن؟

(١٧) پاشان هەروەکو ئەوانیشمان لێکرد ئەو گەلە خوانەناسەی پاش ئەوانیش.واتە تائەم سەردەمەی ئێوە هەمو گەلێکی تاوانباروملهوڕمان تێك پێك داوەو لەناومان بردوون.

أَلَمْ نَخْلُقكُّم مِّن مَّآءٍ مَّهِينٍ ﴿٢٠﴾ فَجَعَلْنَٰهُ فِى قَرَارٍ مَّكِينٍ ﴿٢١﴾ إِلَىٰ قَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢٢﴾ فَقَدَرْنَا فَنِعْمَ ٱلْقَٰدِرُونَ ﴿٢٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٤﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ كِفَاتًا ﴿٢٥﴾ أَحْيَآءً وَأَمْوَٰتًا ﴿٢٦﴾ وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَٰسِىَ شَٰمِخَٰتٍ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٢٨﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ مَا كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿٢٩﴾ ٱنطَلِقُوٓا۟ إِلَىٰ ظِلٍّ ذِى ثَلَٰثِ شُعَبٍ ﴿٣٠﴾ لَّا ظَلِيلٍ وَلَا يُغْنِى مِنَ ٱللَّهَبِ ﴿٣١﴾ إِنَّهَا تَرْمِى بِشَرَرٍ كَٱلْقَصْرِ ﴿٣٢﴾ كَأَنَّهُۥ جِمَٰلَتٌ صُفْرٌ ﴿٣٣﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٤﴾ هَٰذَا يَوْمُ لَا يَنطِقُونَ ﴿٣٥﴾ وَلَا يُؤْذَنُ لَهُمْ فَيَعْتَذِرُونَ ﴿٣٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٧﴾ هَٰذَا يَوْمُ ٱلْفَصْلِ ۖ جَمَعْنَٰكُمْ وَٱلْأَوَّلِينَ ﴿٣٨﴾ فَإِن كَانَ لَكُمْ كَيْدٌ فَكِيدُونِ ﴿٣٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٠﴾ إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى ظِلَٰلٍ وَعُيُونٍ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشْتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُوا۟ وَٱشْرَبُوا۟ هَنِيٓـًٔۢا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٤٤﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٥﴾ كُلُوا۟ وَتَمَتَّعُوا۟ قَلِيلًا إِنَّكُم مُّجْرِمُونَ ﴿٤٦﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱرْكَعُوا۟ لَا يَرْكَعُونَ ﴿٤٨﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿٤٩﴾ فَبِأَىِّ حَدِيثٍۭ بَعْدَهُۥ يُؤْمِنُونَ ﴿٥٠﴾

(١٨) هەر ئاوەهایش دەکەین بە تەواوی تاوانبارانی ئێستاو لەوانەی کە پاش ئەوانیش دێن.

(١٩) وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان کە سزای خوا دادەبارێت بەسەریاندا، ئینجا مرۆڤ دەباتەوە بۆ خۆناسینو دەفەرموێ:

(٢٠) ئایا ئێوەمان لە ئاوێکی بێ نرخ دروست نەکردوە؟

(٢١) ئەوسا لە جێگایەکی بتەودا کە ڕەحمی دایکە جێمان نەکردنەوە؟

(٢٢) هەتا ماوەیەکی دیاری کەشەش مانگ یان نۆ مانگو زیاتریش ، جا لەو ماوەیەدا ئەو دڵۆپە ئاوەمان کرد بەو مرۆڤەی کە بە شلوشۆڵی دێتە ئەم جیهانەوە کە توانای مێشولەیەکیشی نیە کە لە خۆی دوری بخاتەوە، ئەی کێ لە ڕەحمدا پاراستویەتیو ئەو ئەندامانەی پێداوەو پاشان ئێستا فێری ئەوەی کردوە کە مەمکی دایکی بگرێتو بیمژێت؟ ئاشکرایە هەمو دەڵێن: الله ئەگەر بە زمانی حاڵیش بێت، جا دەفەرموێ:

(٢٣) ئێمە توانیمان ئەوکارەگەورەوگرنگە بکەین ئای چەند جوان توانیمان ئەو کارە بکەینو چەند جوان ئەندازەمان گرتو ئەو دڵۆپە ئاوەمان ئاوا نەخشو نیگار لێ پەیداکردو هیچ شوێنەوارێکی ئەو دڵۆپە ئاوەشی پێوەنەماوە، بە داخەوە ئێستا وا خۆی بادەداو بەدەعیەو فیزەوە هاتوچۆو قسە دەکات دەڵێ

٧٨ سُورَةُ النَّبَإِ ٤٠

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

عَمَّ يَتَسَآءَلُونَ ﴿١﴾ عَنِ ٱلنَّبَإِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٢﴾ ٱلَّذِى هُمْ فِيهِ مُخْتَلِفُونَ ﴿٣﴾ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ ثُمَّ كَلَّا سَيَعْلَمُونَ ﴿٥﴾ أَلَمْ نَجْعَلِ ٱلْأَرْضَ مِهَٰدًا ﴿٦﴾ وَٱلْجِبَالَ أَوْتَادًا ﴿٧﴾ وَخَلَقْنَٰكُمْ أَزْوَٰجًا ﴿٨﴾ وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا ﴿٩﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ لِبَاسًا ﴿١٠﴾ وَجَعَلْنَا ٱلنَّهَارَ مَعَاشًا ﴿١١﴾ وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا ﴿١٢﴾ وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا ﴿١٣﴾ وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلْمُعْصِرَٰتِ مَآءً ثَجَّاجًا ﴿١٤﴾ لِّنُخْرِجَ بِهِۦ حَبًّا وَنَبَاتًا ﴿١٥﴾ وَجَنَّٰتٍ أَلْفَافًا ﴿١٦﴾ إِنَّ يَوْمَ ٱلْفَصْلِ كَانَ مِيقَٰتًا ﴿١٧﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ فَتَأْتُونَ أَفْوَاجًا ﴿١٨﴾ وَفُتِحَتِ ٱلسَّمَآءُ فَكَانَتْ أَبْوَٰبًا ﴿١٩﴾ وَسُيِّرَتِ ٱلْجِبَالُ فَكَانَتْ سَرَابًا ﴿٢٠﴾ إِنَّ جَهَنَّمَ كَانَتْ مِرْصَادًا ﴿٢١﴾ لِّلطَّٰغِينَ مَـَٔابًا ﴿٢٢﴾ لَّٰبِثِينَ فِيهَآ أَحْقَابًا ﴿٢٣﴾ لَّا يَذُوقُونَ فِيهَا بَرْدًا وَلَا شَرَابًا ﴿٢٤﴾ إِلَّا حَمِيمًا وَغَسَّاقًا ﴿٢٥﴾ جَزَآءً وِفَاقًا ﴿٢٦﴾ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ لَا يَرْجُونَ حِسَابًا ﴿٢٧﴾ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا كِذَّابًا ﴿٢٨﴾ وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ كِتَٰبًا ﴿٢٩﴾ فَذُوقُوا۟ فَلَن نَّزِيدَكُمْ إِلَّا عَذَابًا ﴿٣٠﴾

هەرگیز سەرەتای خۆی نەزانیوەو خۆیشی نەناسیوە، بەڕاستی وایە چونكە ئەو كەسەی كە بەڕاستی خۆی بناسێت، خوایش دەناسێت، وە ئەو كەسەیش كە خوای ناسی ئاوا لوت بەرزو بەدەعیەوەو فیز نابێت.

﴿٢٤﴾وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان.

﴿٢٥﴾ئایا ئێمە زەویمان نەكرد بە شوێنی سەقامگیری‌و گردبونەوەو یەكگرتنتان‌و هەموتان لەناویدا كۆببنەوە،

﴿٢٦﴾بە زیندوو بە مردوتانەوە؟

﴿٢٧﴾جا ئایا لەناویدا چیا گەلی بەرزو بتەومان دروست نەكردوەو بە ئاوی خۆشیش ئاومان پێنەداون؟ دەی بۆچی سوپاسی ئێمە ناكەن‌و پەیرەوی پێغەمبەر ﷺ و بەرنامەكەی ناكەن‌و باوەڕی پێ ناهێنن؟

﴿٢٨﴾وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان.

﴿٢٩﴾ئادەی بڕۆن بەرەو شتێك كە بە درۆتان دەزانی كە قیامەت‌و سزایە.

﴿٣٠﴾ بڕۆن بۆ سێبەرێك كە خاوەنی سێ شاخەیە چ لە گەورەیدا بووە بە سێ بەشەوە لەسەر خوانەناسان یان مەبەست سێ بەشە لەلای ڕاست‌و لەلای چەپ‌و لەسەر سەریانەوە.

﴿٣١﴾جا نە سێبەرێكە فێنكیان بكاتەوە، وە نە لە بڵێسەی دۆزەخ بێنیازیان دەكات.

﴿٣٢﴾بەڕاستی ئەو ئاگرە بزوزكی وای لێ دەبێتەوە دەڵێی كۆشكە ئەوەندە گەورەیە.

﴿٣٣﴾جالە ڕەنگیشدا دەڵێی وشتری زەردە ئەوەندە زەردە ڕەش دەنوێنێت.

﴿٣٤﴾ وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان بۆ دیمەن‌و بارودۆخ‌و گوزەرانی خوانەناسان، ئینجا پێیان دەوترێت:

﴿٣٥﴾ئەمە ڕۆژێكە قسە ناكەن.

﴿٣٦﴾ماوەی قسەكردنیشیان پێنادرێت جا با بەهانە بهێننەوە، ئەمە گاڵتە پێكردنیانە ئەگەر ماوەی قسەكردنیان پێنەدرێت ئەی چۆن‌وبە چی بەهانە بهێننەوە؟!

﴿٣٧﴾ وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان دەبێ چۆن بێت دیمەن‌و بارودۆخ‌و گوزەرانی خوانەناسان، جا ئەودیمەنەدێنێتە بەرچاومان وەك ئەوەی كەئێستا لەوێدا بین‌و دەفەرموێ:

﴿٣٨﴾ئەمە ڕۆژی جیاكردنەوەیەكەئێوەو پێشوەكانیشمان لێرەدا كۆكردوەتەوە.

﴿٣٩﴾ئەوسا ئەگەر فرو‌فێڵتان هەیە بۆ لابردنی ئەم بارودۆخەی خۆتان‌و دەتوانن خۆتان ڕزگار بكەن لەم سزایە كە دەیبینن، دەی دەست بەكاربن‌و فرو‌فێڵی خۆتان بكەن، ئاشكرایە هیچیان پێناكرێت، هەروەك لە فەرمودەیەكی قودسیدا هاتوە كەخوا دەفەرموێ: {يَا عِبَادِي إِنَّكُمْ لَنْ تَبْلُغُوا ضَرِّي فَتَضُرُّونِي وَلَنْ تَبْلُغُوا نَفْعِي فَتَنْفَعُونِي /مسلم وغيره/ ئەی بەندەكانم ئێوە هەرگیز ناگەن بەوشتەی كە سودی منە تا سودم پێبگەیەنن، وە هەرگیز نایشگەن بەو شتەی كە زیان بەمن بگەیەنێت تا زیانم لێ بدەن} كەوابو ئێمە تەنها بۆ ناوخۆمان ماوەمان پێدراوە كە زیان‌و سود بگەیەنین ئەویش ئەگەر خوا ئارەزۆی لێبێت، فیرعەون بۆ ئەوەی موسا نەبێت هەزاران منداڵی كوشت بەڵام موسای ﷻ نارد لە ماڵی فیرعەوندا گەورەی كرد، هەر ئەم داستانە كە چەندین جار لە قورئاندا وتراوەتەوە بەسە بۆ خاوەن باوەڕان بۆ چاك كردنی بیرو باوەڕەكەیان، ئای بەداخەوە چەندین باوەڕدارمان هەیە بەڵام موشریكەو بەندایەتیەكەی بەلاشەو هیچ سودێكی پێنادات.

﴿٤٠﴾وای واوەیلایە لەو ڕۆژدا بۆ بێباوەڕان. ئینجا پەروەردگار پاش سزای تاوانباران باسی پارێزكاران‌و پاداشتەكەیان دەكات‌و دەفەرموێ:

(٤١) بە بێگومان تەواوی پارێزکاران وان لەژێر سێبەری درەختە پانو پۆڕەکانی بەهەشتو لەسەر کانی ئاوەکاندان،

(٤٢) جا لەناو میوەجاتێك دان لەوانەی کە ئارەزۆیان لێیەتی،

(٤٣) کە پێیان دەوترێت: بەهۆی ئەو کارە چاکانەی کە لە دنیادا کردوتانە بخۆنو بخۆنەوە نۆشی گیانو عافیەتتان بێت.

(٤٤) بێگومان ئێمە هەرئاوەها پاداشتی چاکە کاران دەدەینەوە، پاداشتی هیچ چاکە کارێك زایە ناکەین.

(٤٥) وای واوەیلایە لەو ڕۆژدا بۆ بێباوەڕان. ئینجا بەگاڵتەوە لە دنیادا پێیان دەوترێت:

(٤٦) بخۆنو کەمێك ڕابوێرن بێگومان ئێوە تاوانبارن.

(٤٧) وای واوەیلایە لەو ڕۆژدا بۆ بێباوەڕان .

(٤٨) خۆ هەر کاتێك بەو تاوانبارانە بوترێت گەردنکەچ بکەن بۆ خواو بەندایەتی ئەو زاتە بکەن ئەوان لە خراپەی خۆیان پاشگەز نابنەوەو گەردنکەچ ناکەن بۆ پەروەردگاریان.

(٤٩) وای واوەیلایە لەو ڕۆژدا بۆ بێباوەڕان و تاوانباران. ئەم ڕستەیە دە جار لەم سورەتەدا وتراوە، ئەگەرچی ئێمە ماناکەیمان هەر بە یەك شێوە وتوە ، بەڕاستی هەر کام لە جێگای خۆیدا تامێکی تایبەتی خۆی هەیە. والله أعلم.

(٥٠) سا ئیتر پاش ئەو قورئانە پڕ پەندو ئامۆژگاریە ئەی خوانەناسان بە کام قسەیەکی تر باوەڕ دەکەن؟ ئێمەش دەڵێین باوەڕمان هەیە بە خواو بەپەراوەکەی.

## سورەتی نەبە ء (٧٨) (٤٠)

سورتی (نەبەء) کە حەفتاو هەشتەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، چل ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین هەشتاهەمین سورەتەو پاش سورەتی (المعارج)و پێش (النازعات) دابەزیوە. ئەم سورەتە بەم ناوانەش ناوبراوە: (عمَّ، التَّساؤُل، الْمُعصِرات).

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) خوای دانا دەفەرموێ: هاوەڵدانەران دەربارەی چی پرسیار لە یەکتر دەکەن؟

(٢) لەبارەی ئەوهەواڵە گەورەوە کە ڕۆژی قیامەتە پرسیار دەکەن؟! واتە: نەدەبو ئەو پرسیارە بکەنو گاڵتە بە هاتنی ئەو ڕۆژە بکەن بەڕاستی نەزانن، بۆیە لەو بارەوە پرسیار دەکەن.

(٣) ئەو هەواڵە گەورەی کە ئەوان ناکۆکن تێیدا هەندێکیان باوەڕیان پێی هەیەو هەندێکی تریان بەڕاستی نازانن و بێباوەڕن پێی، ئینجا خوا هەڕەشەیان لێدەکاتو دەفەمویێ:

(٤) بێگومان بەم زوانە دەزانن.

(٥) لەپاشان بێگومان بەم زوانە دەزانن، چونکە بتانەوێ یان نا، پێیدەگەنو بە چاوی خۆتان دەیبینن، ئینجا اللّٰه هەندێ لە دروستکراوە گرنگەکانی خۆی کە بەڵگەی هێزو زانایی و دانایی خۆیەتی باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٦) ئایا زەویمان نەکردوە بە بێشکەیەكو ڕامو گەردنکەچمان نەکردوە تا ئێوە لەسەری بحەسێنەوە؟ لە وشەی (مهاد) ئەم سێ شتە وەردەگرین **یەکەم**: چۆن لەبێشکەدا هەمو پێویستیەکانی منداڵ ئامادەیە و پەکی بۆهیچ ناکەوێت، زەویش ئاوەهایەو هەر شتێك کە مرۆڤ پێویستی پێی هەبێت ئامادەیە تێیدا. **دووهەم**: بێشکە شتێکی جوڵەکەرە بەشێوەیەك کە منداڵەکە تێیدا بحەسێتەوە نەك بەشێوەیەك کە منداڵەکە بترسێتو ئارام نەگرێت، زەویش هەروا بەردەوام بەپەلە لەڕۆیشتندایە بۆهێنانەدی پێویستیەکانی مرۆڤ بەبێ ئەوەی دانیشتوانی هەستی پێبکەنوهەراسان ببن، **سێهەم**: بێشکە جێگایەکی کاتیە هەروەها ئەم جیهانەش جێگایەکی کاتیە بۆمرۆڤو دەبێ بەجێی بهێڵێت . ئینجا دەفەرموێ:

(٧) ئایا چیاکانمان نەکردوە بە مێخ بۆ ڕاگیرکردنی زەوی؟ ئەو پرسیارانە بۆ دان پێدانانە، واتە حەق وایە هەرچی زووتر وەڵام بدەنەوەو بڵێن : بەڵێ ئەوهەمو شتەگرنگانە دەستکاری خۆتەو بۆ بەرژەوەندی ئێمە وات لێکردون.

(٨) جا ئێوەیشمان بە جووت دروستکردوەو کردومانن بە دوو بەشەوە بەشێك نێرو بەشێك مێ تا بەو هۆیەوە زاوزێ بکرێتو بەرەی ئادەمی زیاد ببێتو لەگەڵ یەکتردا ئارام بگرنو بحەسێنەوەو خۆشەویستیتان زیاتر بکات بۆ یەکتری، وەك لە سورەتی (الروم) ئایەتی: بیستویەك دا دەفەرموێ:﴿هەندێك لە نیشانەکانی دانایی و هێزی خۆی ئەوەیە کە لە خۆتان هاوسەری بۆ دروستکردون تا لەگەڵیدا ئارام بگرنو لەناو تاندا خۆشەویستیو بەزەیی بە یەکتری دروستکردوە﴾وەدەفەرموێ:

(٩) جا ئایا خەوەکانتانمان بۆ نەکردون بەهۆی پشودانو ئیسراحەتتان؟

(١٠) وەئایا شەومان بۆ نە کردون بە پۆشاکێك کەداتان دەپۆشێت تا تێیدا بحەسێنەوەو ئامادەی کارو تەلاش ببن بۆ ڕۆژی پاشی ؟ ئەگەر خوا شەوی دروست نەکردایە کێ ئاوا کاتێکی بۆ دروست دەکردن بۆ حەسانەوە؟

(١١) دەی ئایا ڕۆژمان نەکردوە بەکاتێکی گونجاو بۆ کارو تەلاش بۆ پەیداکردنی بژێویتان؟ جا حەق وایە لە شەودا پشو بدەین‌و لە ڕۆژدا کارو کۆشش بکەین کەئەوە بەسودە بۆژیان‌و تەندروستیمان.

(١٢) جا لەسەر ئێوەوە حەوت ئاسمانی بەهێزمان دروستکردوە.

(١٣) وە دامان ناوەتێیدا چرایەکی زۆر بە شەوق وپرشنگدار.

(١٤) جا لە هەورەوە کە بە با پاڵی دەنێین بارانی زۆرتان بۆ دەبارێنین. وشە (ثَجَّاجًا) بە مانای ڕژاندنە، وەك پێغەمبەرمانﷺ سەبارەت بە ئیشە گرنگەکانی حەج دەفەرموێ: {أَفْضَلُ الحَجِّ الْعَجُّ وَالثَّجُّ/الترمذی.حسنه‌الالبانی/ گەورەترین ئیشەکانی حەج دەنگ بەرزکردنەوەیە بە زیکری خواو خوێن ڕژاندنە بە حەیوان سەربرین} ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٥) بۆیە بارانتان بۆ دەبارێنین تا بەو ئاوە دانەوێڵەو گیاکان سەوز بکەین بۆ خۆتان‌و بۆ مەڕوماڵاتتان.

(١٦) وە بیستانی پڕ دارو درەختی جۆراوجۆرو بە میوەی ڕەنگاو ڕەنگیش. بەڵێ بە یەك ئاوو لە یەك خاکدا سەدان میوە سەوز دەکات‌و هەریەکەی جۆرێك میوە دەگرێت، هەر میوەیەکیش تامێکی تایبەتی خۆی هەیە، کێ ڕیشەی ئەو درەختەی ڕێنمایی کرد کە چ تامێك لەو خاکەدا هەڵمژێت؟ جا یەکسەر لێرەوەبەرەو کۆتایی تەمەنی ئەم بونەوەرە سرنجمان ڕادەکێشێت‌و دەفەرموێ:

(١٧) بەبێگومان ڕۆژی جیاکردنەوەی چاك‌و خراپ کاتێکی دیارییەو نە پێش دەکەوێت‌و نە دوا دەکەوێت بەڵکو لە کاتی تایبەتی خۆیدا ڕوودەدات.

(١٨) ئەو ڕۆژەی کە فو دەکرێت بە شەیپوردا. بەڵێ هەروەك لەدنیادا فەرماندەو خاوەن دەسەڵاتان ئەگەر ئیشێکی گرنگیان هەبێت شاور لێدەدەن تا هێزو سەربازانیان کۆببنەوەو مەبەستەکەی پێرابگەیەنن هەرئاوەها کاتێك خوا ویستی خەڵکی زیندو بکاتەوە فەرمان دەدا فو بە شەیپوردا دەکرێت، جا خەڵکی هەر یەکە لە جێگای خۆیدا زیندو دەبێتەوە، ئەوسا هەموتان پۆل پۆل بەرەو مەحشەر دێن، پێغەمبەری خوا ﷺدەفەرموێ:{ مَا بَيْنَ النَّفْخَتَيْنِ أَرْبَعُونَ قَالُوا يَا أَبَا هُرَيْرَةَ أَرْبَعُونَ يَوْمًا قَالَ أَبَيْتُ قَالُوا أَرْبَعُونَ شَهْرًا قَالَ أَبَيْتُ قَالُوا أَرْبَعُونَ سَنَةً قَالَ أَبَيْتُ ثُمَّ يُنْزِلُ اللَّهُ مِنْ السَّمَاءِ مَاءً فَيَنْبُتُونَ كَمَا يَنْبُتُ الْبَقْلُ قَالَ وَلَيْسَ مِنْ الْإِنْسَانِ شَيْءٌ إِلَّا يَبْلَى إِلَّا عَظْمًا وَاحِدًا وَهُوَ عَجْبُ الذَّنَبِ وَمِنْهُ يُرَكَّبُ الْخَلْقُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ /الشيخان/

لەنێوان فوپێدا کردنی مردن‌و فوپێداکردنی زیندوبونەوەدا چلە، پرسیار کرا لە ئەبوهورەیرە کە ڕاوی ئەم فەرمودەیە، چل ڕۆژ؟وتی: نازانم، چل مانگ؟ وتی: نازانم، چل ساڵ؟ وتی: نازانم، لە پاشان اللهُ بارانێك لە ئاسمانەوە دەبارێنێت ئێوەیش زیندو دەبنەوە وەکو چۆن گیا سەوز دەبێت، هیچ پارچەیەك لە لەشی مرۆڤدا نامێنێت‌و دەرزێت بێجگە لەو ئێسقانە بچوکەی کۆتایی پشت (کلینچك) ی مرۆڤ کە نارزێت‌و لەوێوە مەخلوقات دروست دەکرێتەوە} بەڵێ کاتێك کە فو کرا بە شەیپوردا هەر لە یەکەم شەیپوردا هەندێك لەمانەی کە لە دواییدا باسیان دەفەرموێت پەیدا دەبن‌و هەندێکی پاش شەیپوری دووهەم ڕوودەدات‌و پیتی (واو) تەنها بۆ پەیوەندییەو هیچی تر ئەوەتە دەفەرموێ:

(١٩) جا ئاسمان دەکرێتەوەو دەبێت بە چەندین دەرگا.

(٢٠) وە چیاکانیش دەڕەوێنرێن‌و وەك سەرابیان لێدێت کە لە ڕواڵەتدا چیان بەڵام لە ڕاستیدا وەکو تەمێکن کە لە پاشدا پارچە پارچەو ورد دەبن وەکو لمی شیکراوەو با لێیان دەدات‌و دەیانخاتە ناو چاڵ‌و چۆڵەکانەوەو زەویان پێ تەخت‌و ڕاست دەکاتەوە وەك لە سورەتی تاها ئایەتی/سەدوپێنج تاسەدوحەوت دا باسی فەرمو. ئینجا اللهُدەفەرموێ:

(٢١) بەڕاستی دۆزەخ پێش قەرەوڵەو ئامادەکراوەو چاوەڕێیانەوبەدیوارێکی ئاگری گەمارۆی خەڵکی داوە،

(٢٢) بۆ سەرکەش‌و یاخیان هەرئەوەیە جێگای گەڕانەوەیانە ، بیانەوێت یان نەیانەوێت، بەڵێ هەمو کەسێك دەبێت بە سەر ئاگری دۆزەخدا بڕوات جا ئەگەر ماوەی پێدرا ئەوە دەپەڕێتەوە، خۆ ئەگەر ماوەیشی پێنەدرا دەبێ بچێتە ناویەوە. وەك لە سورەتی (مەریەم/ئایەتی هەفتاویەك‌و حەفتاودوودا دەفەرموێ: ﴿هیچکام لە ئێوە نیە کەتێپەڕن بۆ بەهەشت مەگەر بەسەر دۆزەخداو ئەوە شتێکی بێگومانەو بڕیار دراوە، لەپاشدا ئێمە ئەوانەی کە پەرهیزکار بوون ڕزگاریان دەکەین، وە ئەوانەی کە ستەمکار بوون لەناویدا دەیانهێڵینەوە﴾، لێرەش دەفەرموێ:

(٢٣) چەندین چەرخ لەناو ئەو ئاگرەدا دەمێننەوە. وشەی (حقب) واتە ماوەیەکی دیاری لە کات، جا هەندێك بە هەشتا

ساڵی هەر ساڵی سێسەدو شەست ڕۆژی هەر ڕۆژی هەزار ساڵی خۆمان مانای کردوە. ئەوانە کێن؟ ئەوانە کەسانێکن کە باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەتو ئایەتاکانی پەروەردگار نەبوە واتە کافربون، جا کافران بۆ هەمیشەی لە ناو ئاگر دەمێنێنەوە ومەبەستیش لە ئایەتەکە ئەوە نیە کە لە دوای تەواو بونی ئەو ماوەیە ئاگری دۆزەخو سزای کافران نامێنێت، دەقەکانی قورئان ئەوە دەگەیەنن کە کافرانو موشریکانو مونافیقان بۆ هەمیشە لەناو ئاگری دۆزەخدا دەمێننەوەو ڕۆژێك نایەت کە ڕزگار ببن، هەرگیز ناشمرن لەناو ئەو سزاو ئاگرەدا، جا لە پاش تەواو بونی هەر ماوەیەك لە سزادانی بێباوەڕان، سەر لە نوێ سزادانێکی تر دەست پێدەکات، هەروەك لەئایەتی دواتردا دەفەرموێ: ﴿جا ئەی بێباوەڕان ئێمە بێجگە لە سزا شتێکی ترتان بۆ زیاد ناکەین﴾ جا هەر لەبەر ئەمەیە کە هەندێ لە سەلەف وتویانە( لَيسَ لِلأَحقَابِ عِدَةٌ إلا الخُلُود/ البغوي/ بۆئەحقاب ماوەیەك نیە بێجگە لەهەمیشەیی)

(٢٤) هیچ ساردییەكو هیچ خوارنەوەیەکی تێداناخۆنەوە.

(٢٥) مەگەر ئاوی داخو خوێنو زوخاوی دۆزەخیان کاتێ کەنزیکی دەمیان دەکەنەو بۆخواردنەوە چەرمی دەمو چاویان دەکەوێتە ناویەوەو کاتێ دەیشیخۆنەوە ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە دەکات، وەك لە سورەتی (محمد)دا فەرموی، ئەمەش تۆڵەی کارە ناپەسەندو خراپەکانیانەو ستەمیان لێ ناکرێت، وەك دەفەرموێ:

(٢٦) ئەمە تۆڵەیەکی ڕێکە لەگەڵ کردەوەکانیاندا.

(٢٧) بەڕاستی ئەوانە چاوەڕوانی هیچ حیسابێکیان نەدەکردو باوەڕیان پێ نەبو.

(٢٨) جا بێباوەڕبون بە نیشانەکانی ئێمە ئەو هەمو بەڵگە گەورەو گرنگەیان بە ڕاست نەدەزانی.

(٢٩) خۆ ئێمەیش هەمو شتێکمان لە پەڕاوی تایبەتی خۆیاندا تۆمار کردوەو هیچمان لێ نەگۆڕاوەو هیچیشمان لێ ون نەبوە، لەو ڕۆژەدا هەر کەس بەگوێرەی کردەوەی خۆی حیسابی لەگەڵدا دەکرێتو بە تاوانباران دەوترێت:

(٣٠) دەی سا بچەژن پاداشتی کردەوە خراپەکانتان، با دڵنیا بن کە ئێمە بێجگە لە سزا شتێکی ترتان بۆ زیاد ناکەین. واتە لەو

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعْنَٰبًا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتْرَابًا ﴿٣٣﴾ وَكَأْسًا دِهَاقًا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا وَلَا كِذَّٰبًا ﴿٣٥﴾ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ رَّبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ٱلرَّحْمَٰنِ لَا يَمْلِكُونَ مِنْهُ خِطَابًا ﴿٣٧﴾ يَوْمَ يَقُومُ ٱلرُّوحُ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ ٱلْيَوْمُ ٱلْحَقُّ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ مَـَٔابًا ﴿٣٩﴾ إِنَّآ أَنذَرْنَٰكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ ٱلْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِى كُنتُ تُرَٰبًۢا ﴿٤٠﴾

## ٧٩ سُورَةُ النَّازِعَاتِ ٤٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلنَّٰزِعَٰتِ غَرْقًا ﴿١﴾ وَٱلنَّٰشِطَٰتِ نَشْطًا ﴿٢﴾ وَٱلسَّٰبِحَٰتِ سَبْحًا ﴿٣﴾ فَٱلسَّٰبِقَٰتِ سَبْقًا ﴿٤﴾ فَٱلْمُدَبِّرَٰتِ أَمْرًا ﴿٥﴾ يَوْمَ تَرْجُفُ ٱلرَّاجِفَةُ ﴿٦﴾ تَتْبَعُهَا ٱلرَّادِفَةُ ﴿٧﴾ قُلُوبٌ يَوْمَئِذٍ وَاجِفَةٌ ﴿٨﴾ أَبْصَٰرُهَا خَٰشِعَةٌ ﴿٩﴾ يَقُولُونَ أَءِنَّا لَمَرْدُودُونَ فِى ٱلْحَافِرَةِ ﴿١٠﴾ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا نَّخِرَةً ﴿١١﴾ قَالُوا۟ تِلْكَ إِذًا كَرَّةٌ خَاسِرَةٌ ﴿١٢﴾ فَإِنَّمَا هِىَ زَجْرَةٌ وَٰحِدَةٌ ﴿١٣﴾ فَإِذَا هُم بِٱلسَّاهِرَةِ ﴿١٤﴾ هَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿١٥﴾

کاتەدا ئاوەها نائومێد دەکرێن، ئینجا ﷲ پاش باسی خراپەکارانو سزاکانیان باسی پیاو چاکانو پاداشتەکانیان دەکاتو دەفەرموێ:

(٣١) بەڕاستی بۆ پارێزکاران جێگای خۆش هەیەو ڕزگارن لە ئێشو ئازارو هەموغەم.وە ئامادەیە بۆ ئەوان،

(٣٢) چەندین بێستانو چەندین باخچەی ترێ.

(٣٣) خۆ بۆیشیان ئامادەکراوە کچانی مەمك خڕی هاوسنو ساڵی خۆیان. وشەی (کواعب) بەو ئافرەتانە دەڵێن: کە مەمکیان قیتەو لارنەبوەتەوە چونکە کچانێکی تازەپێگەیشتوی دەست لێ نەکەوتون.

(٣٤) هەروەها بۆ پارێزکاران هەیە شەرابی خۆشمەزە، یەك لە دوای یەك پەرداخی پڕ لەشەرابی پاكو پاڵفتەیان پێدەدرێت.

(٣٥) جا لەو جێگا پڕ لە سەیرو سەفادا هیچ قسەیەکی بێسودو هیچ تاوانێك نابیستنویەکتر ناخەن بەدرۆوە. بەڵکو هەر قسەی پاكو جوانو سەلامکردنەو هەمویان ڕێكوپێكو بێعەیبنو لە ژیانێکی ئاسودەو بەختەوەریدا دەژین.

(٣٦) ئەوەی کەباسکرا بۆ پارێزکاران پاداشتێکی گەورەی پەروەردگارت بو کە بەخشی بەوان بە لێشاویوبە زۆری کە

بەسیان بو. ئینجا ﷲ باسی موڵكو دەسەڵاتی خۆی دەكاتو دەفەرموێ:

(٣٧) پەروەردگارت ئەو زاتەیە كە خاوەنو پەروەردگاری ئاسمانانو زەویو ئەوەی كە لە نێوانیاندا هەیەو بێسنور بەسۆزە، هیچ كەس ناتوانێت پێشەكی قسەی لەگەڵدا بكات لە ترسو سامدا هەتا خۆی ماوەی پێنەدات،وەك لە سورەتی (هود) لە ئایەتی سەدوپەنجادا دەفەرموێ: ﴿رۆژێك دێت كە هیچ كەس ناتوانێت قسە بكات مەگەرتەنها بە ئیزنی ئەوزاتە﴾ لێرەش دەفەرموێ:

(٣٨) لەو رۆژەدا رۆحو فریشتەكان هەموویان ریز دەبنو هیچ كەسیان قسە ناكات، تەنها ئەو كەسەی كە رەحمان ئیزنی بداتو قسەی راستو دروست بكاتو لە دنیادا قسەی راستو دروست بوبێت واتە ئەهلی تەوحید بوبێت، لەبارەی (رۆح)ەوە چەند قسە كراوە لەوانە: یەكەم: گیانی نەوەی ئادەم. دووهەم: نەوەی ئادەم. سێهەم: دروستكراوێكن لە دروستكراوەكانی خوا لەسەر شێوەی نەوەی ئادەم نە فریشتەنو نە نەوەی ئادەمنو دەخۆنو دەخۆنەوە. چوارەم: جبرەئیل. پێنجەم: قورئان. شەشەم: فریشتەیەكە لە هەمو فریشتەكان گەورەترە. والله أعلم. ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٣٩) ئەو رۆژەی كە باسكرا رۆژێكی راستەو دێتەدی، جا ئەو كەسەی كە ئارەزۆی لێیە، با بەرەو رێبازی پەروەردگاری خۆی بگەرێتەوە تا لەو رۆژەدا سەرفەرازو كامەران بێت، واتە: لاساریو خراپەكاری مرۆڤ زیانێك لە خوا نادات بەڵكو زیانی بۆ خۆتانەو خواش دنیای بۆ تاقیكردنەوە دروستكردووە ئێوەی كردوە بە سەرپشك لە هەڵبژاردنی چاكو خراپدا ئەو رۆژە گەورەشی دروستكردوە بۆ پاداشتو تۆڵە بۆیە پاش ئەمە دەفەرموێ:

(٤٠) بێگومان ئێمە پێمان راگەیاندنو ئێوەمان ترساند لە هاتنی سزایەكی نزیك كە رۆژی قیامەتە كەئەو رۆژە هەمو كەس دەبینێت كە چی پێش خۆی خستوە لە چاكو لە خراپ وەك لە سورەتی (كەهف) ئایەتی چلونۆدا دەفەرموێ: ﴿هەر چییان كردوە بەئامادەكراوی دەستیان دەكەوێتەوە﴾ وە لە سورەتی (قیامە) ئایەتی سیانزەدا دەفەرموێ: ﴿لەو رۆژەدا هەمو مرۆڤەكان هەواڵیان پێدەدرێت بەوەی كە پێشیان خستوەو بەوەی كە لە پاشیان بەجێماوە لە چاكو لە خراپ﴾ جا لێرەش خوا دەفەرموێ: بێباوەڕ دەڵێت: خۆزگە خاك بومایەو زیندو نەكرامایەوە بۆ ئەم حیسابو كیتابە، یان هەر نەبومایە، یان لە مرۆڤ نەبومایە، پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: { لَتُؤَدُّنَّ الْحُقُوقَ إِلَى أَهْلِهَا حَتَّى يُقَادَ لِلشَّاةِ الْجَلْحَاءِ مِنْ الشَّاةِ الْقَرْنَاءِ /مسلم وغیره/ سوێند بە ﷲ دەبێ مافی هەموكەسێك بدەنەوە هەتا تۆڵەی حەیوانی بێ شاخ وەردەگیرێتەوە لەحەیوانی شاخدار}

جا لە دوای ئەوەی كە پەروەردگار گیانلەبەرانیش لە گەڵ مرۆڤ و جنۆكە كۆدەكاتەوە، ئینجا پاش ئەوەی كەحیسابو كیتابی لەگەڵدا كردن دەیان كاتەوە بە خاك، جا ئەو كاتە بێباوەڕانیش ئاوات دەخوازنو دەڵێن: خۆزگە ئێمەش خاك بوینایە، بەڵێ بێباوەڕان لەو رۆژەدا دەزانن كە قسەی پێغەمبەرانو پیاوچاكان راستەو هیچ دەرفەتێكی تریان نیە، ئەوسا جارێك درۆدەكەنو جارێك گەورەو ئاغاكانیان بە تاوانبار دادەنێنو جنێویان پێدەدەنو جارێك داوای گەرانەوە بۆدنیا دەكەن تا ئیتر خراپە نەكەنو جارێك ئاوات دەخوازن هەر نەبونایە بەلأم هیچكام لەوانە سودیان پێنادات‌و هیچ كەسێكیش فریایان ناكەوێت. شیعە دەڵێن: ﴿يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا﴾ وشەی "أباترابا "بوەو گۆڕاوەو مەبەستی پەیرەوانی عەلیە چونكە عەلی بە (ئەبو توراب) ناوبراوە، ئیتر بیر لەوە ناكەنەوە كە ئەم سورەتە لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوەو ئەو كاتە بێ باوەڕانی قورەیش باوەڕیان بە پێغەمبەرو قورئانو رۆژی دوایی نەدەكرد، چ جای ئەوە باوەڕ بە ئیمامەتی منالێكی دەساڵەی وەك عەلی بكەن ئەمە لەلایەك، لەلایەكی ترەوە لە مەدینەدا نازناوی (ئەبو توراب ) بەعەلیەوە نراوەو بەو ناوە نابراوە، وەئەگەر بۆجەدەلیش بلێن وابوە، واتە خۆزگە عەلی بومایە كەی مانای پەیرەوانی عەلییە، هەی نەزان؟!

## سورەتی نازیعات ٧٩ ٤٦

سورەتی نازیعات كە حەفتاو نۆهەمین سورەتی قورئانە،لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوەو چلو شەش ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین هەشتاو یەكەمین سورەتەو پاش سورەتی (النبأ)و پێش (الانفطار) دابەزیوە. ئەم سورەتە بەم ناوانەش ناو براوە: (الساهرة، الطامة).

بەناوی ﷲی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بەو فریشتانەی كە لە قوڵایترین دەمارەوە گیانەكانی خوانەناسان دەكێشن، بەگیانكێشانێكی توند كە خاوەن گیانەكان دوچاری سەختترین ئێشو ئازار دەبن.

(٢) جا سوێند بەو فریشتانەی كە بە سۆزو خۆشەویستیو دڵ نەرمیەوە گیانی خواناسان دەكێشن.

(٣) وە سوێند بەو فریشتانەی کە لە هاتوچۆدان لە ئاسمانەکانەوە بۆ زەوی‌و لە زەویشەوە بۆ ئاسمانەکان بۆئەنجامدانی فەرمانەکانی ﷲ.

(٤) سا سوێند بەو فریشتانەش کە کێبەرکێ دەکەن بۆ ئەنجامدانی فرمانی ﷲو ئەوانەی کە گیانی خاوەن باوەڕان بەپەلە بۆ بەهەشت دەبەن.

(٥) وە سوێند بەو فریشتانەی کە جێ بەجێکەری کارێکی گرنگن. ئەم وشانە بە چەند شێوەی تر مانا کراون بەڵام ئەمەیانم هەڵبژارد، جا ﷲ سوێند دەخوات بەو فریشتانەو وەڵامی نەفەرموە واتە : سوێند بەو فریشتانە زیندوتان دەکەینەوە، لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەم قسەیە ڕونتر بکەمەوە بۆ خاوەن باوەڕان بەڵکو سودی زیاتری لێ وەربگرن، ﷲبۆی هەیە سوێند بخوات بە هەر شتێك کە خۆی ئارەزۆی لێبێت، بەڵام ئێمە نابێت سوێند بە غەیری خوا بخۆین، چونکە جیاوازی لەنێوان سوێندی ئێمەو خوادا هەیە، ئێمە بۆیە سوێند دەخوێن تا باوەڕمان پێبکرێت کە ئەو قسەیە ڕاستە بەڵام خوا پێویستی بەوە نیە، چونکە هەمو قسەکانی ڕاستەو پێویستە مرۆڤ بەگوێی بکات، لێرەدا لەوانەیە ئەو پرسیارە بکرێت: دەی ئیتر سوێندخواردنی ﷲ سودی چیە؟ دەڵێین سوێندەکانی ﷲ سودی زۆرن لەوانە:

**یەکەم** - بۆ ئەوەیە کەخەڵکی ئەو سوێند لەسەرخوراوە بە گرنگ بگرن‌و بە شتێکی سادەو کەمی نەزانن.

**دووهەم** - ﷲ دەیەوێت سودی ئەو سوێند پێخوراوانە دەرخات بۆ خەڵك چ سودی مادی بێت وەکو هەنجیرو زەیتون، وە ڕۆژو مانگ... یان سودی مەعنەوی بێت وەکو قورئان‌و قەڵەم‌و نوسین.

**سێهەم** - تا بزانێت کە سوێند پێخوراوان شتێکی ڕاستن‌و هەن وەك فریشتەکان‌و ڕۆژی قیامەت.

**چوارەم** - بۆ بەدرۆخستنەوەی بیروڕای پوچ وەك کاتی عەسر کە عەرەبەکان بە کاتێکی خراپیان دەزانی خوا سوێندی بە (عەسر) خواردوەکەکاتێکی بەسودە.

**پێنجەم** - سرنج ڕاکێشانی خەڵك بۆ گرنگی پێدان بەو شتانە وەکو نوسین‌و قەڵەم کە مایەی سەرفەرازی خەڵکن ئەگەر بیروباوەڕی ڕاستەقینەی لەگەڵدا بێت.

**شەشەم** - سوێندەکانی ﷲ بە هەندێك لەو شتانە، بەڵگەی گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوایە کە لە ڕاستیدا سوێندە بە خۆی، ئەمانە هەندێك بون لە سودەکانی ئەو سوێندانەی کە ﷲ خواردونی لە قورئاندا. ئینجا ﷲدەفەرموێ:

(٦) کاتێك کە دەنگو لەرزەو نەعرەتەی گەورە ڕویدا کە شەیپوری یەکەمەو هەمو خەڵك دەمرێت، وە بێجگە لە زاتی حەق هیچ گیانلەبەرێك نامێنێت.

(٧) ئیتر بەدوای ئەو ڕوداوەدا ڕوداوەکانی تر یەك لەدوای یەك دێن، ئەمانە بریتین لە دوو شەپیور لێدانی یەکەم‌و دووهەم، کە **یەکەمیان** بۆ مردنەو **دووهەمیان** بۆ زیندوبونەوەیە کە بەپەلە هەمو مرۆڤەکان بەرەو خاکی شام دەچن‌و لەوێدا ڕاوەستان و ترسان‌و چاوەڕێکردنە تا ئەو کاتەی کە لەلایەن پێغەمبەرمانەوەﷺ داوای هاتنی خواو حوکمکردنی دەکرێت، وەکو لە فەرمودەدا هاتوە.

(٨) لەوڕۆژەدادڵانێك هەراسن‌وتەپە تەپیانە لە ترساندا.

(٩) چاوی ئەو خاوەن دڵانە شەرمەندەو زەبونە لەبەر ئەو هەمو کارەساتە سەختو دژوارانەی کە بە چاوی خۆی دەیبینێت، ئینجا بەرەو دەمەقاڵەی دنیا سرنجمان ڕادەکێشێت‌و دەفەرموێ:

(١٠) بت پەرستان‌و بێباوەڕان بە ڕۆژی دوایی دەڵێن: ئایا ئێمە پاش ئەوەی کە مردین‌و کەوتینە گۆڕەوە، لەو گۆڕەوە جارێکی تر زیندو دەکرێینەوە؟! واتە بەشتێکی دوری دەزانن بۆیە دەڵێن:

(١١) ئایا کاتێك کە ئێمە بوین بە ئێسقانی پتورکاوو رزیو چۆن دەگونجێت وەکو خۆمان لێ بکرێتەوە؟ وشەی (نَخِرة) بە (ناخِرة)ش خوێنراوەتەوە.

(١٢) دەڵێن: ئەگەر ڕاست بێت‌و جارێکی تر زیندو بکرێینەوە بەڕاستی ئەوە گەڕانەوەیەکی زیان ئاوەرە. بەڵێ بێباوەڕان بە ڕۆژی دوایی بیرو بۆچونیان ئاوایەوزیندوبونەوەو حیساب‌و کیتاب بەدرۆ دەزانن و بیر لەوە ناکەنەوە کە ئایا لەپێشەوە لە چی دروستکراون‌و هەمیشە هەر ئەو کاتە دەبینن کە تێیدان، خوایش دەفەرموێ:

(١٣) بەڕاستی ئەو گەڕانەوە نیە بێجگە لە یەك تێخورین کە شەیپورێکەو لێدەدرێت‌و شتێکی تری ناوێت،

(١٤) جا هەر بەو شەیپوورلێدانە کتوپڕ هەمو مرۆڤەکان لەسەر ئەم زەویە زیندو دەبنەوە، ئینجا ﷲ دڵخۆشی پێغەمبەرمان ﷺ دەکات بە باسکردنی موسا ؑلەگەڵ تاغوتی سەردەمی خۆیدا کە فیرعەون بوە، واتە ئەو پێغەمبەرە بەو هەمو بەڵگە دەستەپاچەکەرە (المعجزە) لەگەڵ فیرعەوندا قسەو گفتوگۆی کرد بەڵام ئەو هەر بەردەوام بو لەسەر کوفرو فەسادو

إِذۡ نَادَىٰهُ رَبُّهُۥ بِٱلۡوَادِ ٱلۡمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٦﴾ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿١٧﴾ فَقُلۡ هَل لَّكَ إِلَىٰٓ أَن تَزَكَّىٰ ﴿١٨﴾ وَأَهۡدِيَكَ إِلَىٰ رَبِّكَ فَتَخۡشَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَرَىٰهُ ٱلۡأٓيَةَ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿٢٠﴾ فَكَذَّبَ وَعَصَىٰ ﴿٢١﴾ ثُمَّ أَدۡبَرَ يَسۡعَىٰ ﴿٢٢﴾ فَحَشَرَ فَنَادَىٰ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ أَنَا۠ رَبُّكُمُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٢٤﴾ فَأَخَذَهُ ٱللَّهُ نَكَالَ ٱلۡأٓخِرَةِ وَٱلۡأُولَىٰٓ ﴿٢٥﴾ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَعِبۡرَةٗ لِّمَن يَخۡشَىٰٓ ﴿٢٦﴾ ءَأَنتُمۡ أَشَدُّ خَلۡقًا أَمِ ٱلسَّمَآءُۚ بَنَىٰهَا ﴿٢٧﴾ رَفَعَ سَمۡكَهَا فَسَوَّىٰهَا ﴿٢٨﴾ وَأَغۡطَشَ لَيۡلَهَا وَأَخۡرَجَ ضُحَىٰهَا ﴿٢٩﴾ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ﴿٣٠﴾ أَخۡرَجَ مِنۡهَا مَآءَهَا وَمَرۡعَىٰهَا ﴿٣١﴾ وَٱلۡجِبَالَ أَرۡسَىٰهَا ﴿٣٢﴾ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٣﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلطَّآمَّةُ ٱلۡكُبۡرَىٰ ﴿٣٤﴾ يَوۡمَ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا سَعَىٰ ﴿٣٥﴾ وَبُرِّزَتِ ٱلۡجَحِيمُ لِمَن يَرَىٰ ﴿٣٦﴾ فَأَمَّا مَن طَغَىٰ ﴿٣٧﴾ وَءَاثَرَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿٣٨﴾ فَإِنَّ ٱلۡجَحِيمَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴿٣٩﴾ وَأَمَّا مَنۡ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفۡسَ عَنِ ٱلۡهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلۡجَنَّةَ هِيَ ٱلۡمَأۡوَىٰ ﴿٤١﴾ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلسَّاعَةِ أَيَّانَ مُرۡسَىٰهَا ﴿٤٢﴾ فِيمَ أَنتَ مِن ذِكۡرَىٰهَآ ﴿٤٣﴾ إِلَىٰ رَبِّكَ مُنتَهَىٰهَآ ﴿٤٤﴾ إِنَّمَآ أَنتَ مُنذِرُ مَن يَخۡشَىٰهَا ﴿٤٥﴾ كَأَنَّهُمۡ يَوۡمَ يَرَوۡنَهَا لَمۡ يَلۡبَثُوٓاْ إِلَّا عَشِيَّةً أَوۡ ضُحَىٰهَا ﴿٤٦﴾

سُورَةُ عَبَسَ ٨٠ ٤٢

نالەباری سەرئەنجام موسامان ﷺ رزگارکردو فیرعەونمان لەناوبرد. جا دەفەرموێ:

(١٥) ئایا پێت گەیشتوەو بیستوتە دەنگوباسی موسا،

(١٦) کاتێك کە لە شیوی پیرۆزی "توا"دا پەروەردگاری بانگی کردو نیگای کردە لای و فەرموی:

(١٧) برۆ بۆلای فیرعەون بەڕاستی ئەو لەخۆی بایی بوەو لەسنوردەرچوە،

(١٨) جا پێی بڵێ: ئایا ناتەوێت کە خۆت پاك بکەیتەوە؟

(١٩) جا ڕێنماییت بکەم بۆ لای پەروەردگاری خۆت ئەوسا تۆیش لێی بترسیت؟ جا ئا بەم شێوەیە موسا ﷺ هاتەلای فیرعەون و بەو شێوە نەرمو جوانە قسەی لەگەڵدا کرد،

(٢٠) خۆسەرەڕای ئەوەش بەڵگەی گەورەی ڕاستیو دروستی خۆی پیشاندا کە دەستو گۆپاڵەکەی بو، بەڵام ئەگەر کەسێك نەیویست ڕێگای خوا بگرێت شەیتان چاك فریوی دەداتو هەمو ڕاستیەکی لەبەر چاو لار دەکاتو هەمو لاری و ناپەسەندی و لاسارییەکی لا جوان و ڕێكوپێك دەکات، چونکە دوژمنی بەرەی ئادەمیزادەو بۆ نالەباران و بێباوەڕان ئەوە هێزەیشی هەیە ئەوەتە فیرعەون لەگەڵ ئەو قسە نەرمو جوانانەو ئەو بەڵگە گرنگانەی موسادا لەباتی باوەڕهێنان وبیرکردنەوە لەپاشە ڕۆژی خۆی،

(٢١) جا ئەو باوەڕی پێ نەکردو سەرکەش بو.

(٢٢) لەپاشان پشتی کردە قسەکانی موسا ﷺ کە پەلەیشی دەکرد بۆ دژایەتی کردنی.

(٢٣) جا خەڵکی کۆکردەوە، ئەوسا جاڕیشی دا بەناویاندا.

(٢٤) وتی:منم پەروەردگاری باڵادەستی ئێوەو بەم بانگەوازە ناڕەواو نادروستەی قەبری خۆی هەڵکەندو کەوتە بەر ڕقوقینی اللهِ.

(٢٥) جا خوا تۆڵەی قسەی کۆتاییوسەرەتای لێکردەوە کە کردی بە پەندو ئامۆژگاری بۆ سەردەمی خۆیو پاش خۆیشی. بەڵام هەمیشە هەر خەڵکە ڕاستەکانن لەم پەندو ئامۆژگاریانە سود وەردەگرن، بۆیە دەفەرموێ:

(٢٦) بەڕاستی لەو ڕوداوەدا پەندو ئامۆژگارییەکی گرنگ هەیە بۆ ئەو کەسانەی کە دەترسن لە پەروەردگاری خۆیانو هەمیشە لە هەوڵی ڕازیکردنی ئەودان، ئینجا خوا بۆ ئەوەی دەمکوتی بێباوەڕان بە زیندوبونەوە بکات دەفەرموێ:

(٢٧) ئایا دروستکردنی ئێوە سەختو دژوارە یان ئاسمان؟ کە ئەودروستیکردوە.

(٢٨) کە سەقفەکەی بەرزکردوەتەوەو ڕێكوپێکی کردوە؟

(٢٩) سا شەوەکەی تاریك کردوەو ڕۆژیشی ڕوناك کردوە؟

(٣٠) جا دوای ئەوەش زەوی خستەگڕ بەوشێوەی کە لە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە: { خَلَقَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ التُّرْبَةَ يَوْمَ السَّبْتِ وَخَلَقَ فِيهَا الْجِبَالَ يَوْمَ الْأَحَدِ وَخَلَقَ الشَّجَرَ يَوْمَ الِاثْنَيْنِ وَخَلَقَ الْمَكْرُوهَ يَوْمَ الثُّلَاثَاءِ وَخَلَقَ النُّورَ يَوْمَ الْأَرْبِعَاءِ وَبَثَّ فِيهَا الدَّوَابَّ يَوْمَ الْخَمِيسِ وَخَلَقَ آدَمَ ﷺ بَعْدَ الْعَصْرِ مِنْ يَوْمِ الْجُمُعَةِ فِي آخِرِ الْخَلْقِ فِي آخِرِ سَاعَةٍ مِنْ سَاعَاتِ الْجُمُعَةِ فِيمَا بَيْنَ الْعَصْرِ إِلَى اللَّيْلِ /مسلم، أحمد/ اللهِ خۆڵی لە ڕۆژی شەمەدا دروستکردو لە ڕۆژی یەکشەمەدا چیاکانی لەناو زەویدا دروستکردو، لە ڕۆژی دووشەمەدا دەرختانو لە ڕۆژی سێشەمەدا بەڵاو نەهامەتیەکانو، لە ڕۆژی چوارشەمە نورو ڕوناکی دروستکرد، وەلە ڕۆژی پێنج شەمەدا گیانلەبەرانی لەسەر زەویدا بڵاو کردەوە، جالە کۆتای هەمو دروستکراوەکان لە دواترین وەختی ڕۆژی جومعەلە نێوان عەسرو شەودا ئادەمی دروستکرد} واتە ئەوانە لەو ڕۆژانەدا اللهِ دروستیکردون نەك وابزانی کەلەیەك هەفتەدا اللهِ ئەوانەی بەوشێوە دروستکردوە،چونکە ئاشکرایە کەپاش زەمانێکی درێژ ئادەم دروستکراوە.

(٣١) کەئاوی لێ دەرهێناو لەوەڕی لێ ڕوواند.

(٣٢) چیاکانی بتەوکردەوەو کردنی بە هۆی ڕێكوپێك وەستانی زەوی‌و ئەمانەمان کرد،

(٣٣) تا خۆتان‌و مەڕو ماڵاتتان سودی لێ وەربگرن، جا ئێمە کە ئەم هەمو شتە گەورەو گرنگانەمان دروستکردوە بۆ ناتوانین پاش مەرگ ئێوە زیندو بکەینەوەو چ شتێك هەیە بتوانێت ڕێمان لێبگرێت‌و ببێت بە کۆسپ لە ڕێگای زیندوکردنەوەی ئێوەدا؟ ئینجا دەفەرموێ:

(٣٤) جا ئەو کاتەی کە گەورەترین ڕوداو ڕویدا واتە شەیپوری دووهەم لیێدراو خەڵکی زیندوکرایەوە.

(٣٥) ئەو ڕۆژە مرۆڤ بیردەکاتەوە لەو شتانەی کە لە دنیادا ئەنجامیداوەو هەموی دەخرێتە پێش چاوی‌و گەورەو بچوکی لەبیر نەکراوە، بەڵام چ سودی هەیە ئەو بیرکردنەوەیە؟

(٣٦) ئەوسا دۆزەخ ئاشکرا دەبێت بۆ هەر کەسێك کە بیەوێ ببیینێت دەی بینێت، جا ئەو کاتە خەڵك دوو بەشە:

(٣٧) جا بەشی **یەکەمیان** ئەو کەسەی کە سەرکەش‌و تاوانباربوە لەدنیادا،

(٣٨) وە ژیانی دنیای هەڵبژاردوەو هەر لە بیری کەیفو خۆشی‌و کۆکردنەوەی سەروەت‌و سامانی دنیادا بوە،

(٣٩) بێگومان دۆزەخ هەر هی ئەوەو ئارامگایەتی‌و ناتوانێت لە دەستی دەربچێت‌و خۆی پەنابدات، بەشی **دووهەم** دەفەرموێ:

(٤٠) خۆ ئەو کەسەیش کە ترساوە لەو کاتەی کە لە پێشگای پەروەردگاریدا ڕادەوەستێت‌و ترساوە لەو بڕیارەی کە لەو کاتەدا بەسەریدا بدرێت‌و لەدنیادا بەرگری نەفسی خۆی کردوە لە ئارەزۆکاری‌و جڵەوی بۆ شل نەکردوەو بە بەندایەتی‌و خواناسیەوە سەرگەرم بوە،

(٤١) ئەوسا بەبێگومان ئەوە ئەو کەسە هەر بەهەشت جێگایەتی، بەم شێوەیە بەکورتی ئیشی خراپەکاران‌و سزای ئایندەیان‌و ئیشی چاکەکاران‌و پاداشتی ئایندەیانی باسکرد، ئاشکرایە هەمو مرۆڤێك کاتێك هەواڵی هاتنی شتێکی گرنگی پێدرا زۆر حەزدەکات کە بە تەواوی کاتی ڕودان‌و پەیدابون‌و هاتنی بزانێت‌و پێغەمبەرمان ﷺ هەواڵی هاتنی ڕۆژی دوایی‌و کۆتاهاتنی ئەم جیهانەی پێدرابو، ئەویش بە خەڵکی ڕاگەیاندبو لەوانەیە ڕۆژانە چەندین جار لەبارەی کاتی هاتنیەوە پرسیاری لێکرابێت‌و ئەویش دیارە پێی خۆشبوە کاتی هاتنی بە وردی بزانێت، بەڵام خوای زاناو کاربەجێ نایەوێت کەخەڵکی کاتی هاتنی ئەوڕۆژەبزانن، بۆیە لێرەدا دەفەرموێ:

(٤٢) پرسیارت لێدەکەن لەبارەی هاتنی ڕۆژی قیامەتەوەو دەڵێن: کەی نەمانی دنیا دێت‌و قیامەت پەیدادەبێت؟

(٤٣) تۆ چیت دەوێت لە باسکردنی کاتەکەی، جا دەگونجێت پێغەمبەر ﷺزانیاری پێدرابێت بۆ خۆی‌و فەرمانی پێنەدرابێت بە خەڵکی ڕابگەیێنێت، دەشگونجێت پێغەمبەریش ﷺ نەیزانیبێت کە ئەم مانایە زۆرتر نزیکە لە ڕواڵەتی ئایەتەکەوە، چونکە دەفەرموێ:

(٤٤) زانینی کاتی هاتنی قیامەت لەلای پەروەردگاری تۆ کۆتایی پێدێت، جا جگەلەو زاتە کەسی تر لەو کات‌و ساتە ئاگادار نییە، جا بۆیە کاتێك کە جبرەئیل سەلامی خوای لێبێت پرسیار لە پێغەمبەر ﷺدەکات سەبارت بە کاتی هاتنی ڕۆژی قیامەت ؟پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:{ ما المسئولُ عنها بأَعْلَم مِنَ السائل/ متفق عليه/ پرسیار لێکراوسەبارەت بەوڕۆژە زاناتر نیە لە پرسیارکەر} جا دەفەرموێ:

(٤٥) تۆ تەنها ترسێنەرێکی بۆ ئەو کەسەی کەلەو ڕۆژە دەترسێت. واتە: باوەڕی هەیە بە هاتنی ئەو ڕۆژە سەختەی کە قورئان بە بومەلەرزەی گەورەو بە باری قورسی سەرشانی ئاسمانان‌و زەوی ناوی دەبات وەك لە سەرەتای سورەتی (**حەج**)دا دەفەرموێ: ﴿بێگومان بومەلەرزەی قیامەت شتێکی گەورەیە﴾ و هەروەها لە سورەتی (**الاعراف**: سەدوهەشتاوحەوت)دا بە شێوەی نزیکی ئایەتی هەمان سورەت هاتووەو دەفەرموێ:﴿لەبارەی قیامەتەوەپرسیارت لێدەکەن کە کەی دێت؟ بڵێ:زانینی کاتی هاتنی ئەوڕۆژە لەلای پەروەردگارمە کەئەوکاتەی ڕۆشن ناکاتەوەونایزانێت مەگەر هەربۆ خۆی، بارێکی گرانە لەسەرئاسمانان و زەوی، هەر بەکتوپڕیش دێت، پرسیارت لێ دەکەن وەك ئەوەی کەتۆ زۆر شارەزایت هەبێ لەبارەیەوە، بڵێ:زانینی کاتی هاتنی ئەوڕۆژە لەلای اللهیە بەڵام زۆربەی خەڵك نازانن﴾ لێرەش دەفەرموێ: تۆ ئیشت ئەوەیە کە خەڵك بترسێنیت لە هاتنی ئەو ڕۆژە تا بەڵکو سودت لێوەرگرن‌و خۆیان لە سەرشۆڕی‌و شەرمەندەیی ئەو ڕۆژە ڕزگاربکەن‌و پەلە بکەن لە ئیشی چاکدا، چونکە نازانرێت کەی دێت‌و هاتنەکەیشی کتوپڕیەو کەس ماوەی پەشیمان بونەوەی نابێت، ئەم ژیانەیش لەچاو دوارۆژدا وەك تاقێك وایە وەکو دەفەرموێ:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

عَبَسَ وَتَوَلَّىٰٓ ﴿١﴾ أَن جَآءَهُ ٱلۡأَعۡمَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّهُۥ يَزَّكَّىٰٓ ﴿٣﴾ أَوۡ
يَذَّكَّرُ فَتَنفَعَهُ ٱلذِّكۡرَىٰٓ ﴿٤﴾ أَمَّا مَنِ ٱسۡتَغۡنَىٰ ﴿٥﴾ فَأَنتَ لَهُۥ تَصَدَّىٰ ﴿٦﴾
وَمَا عَلَيۡكَ أَلَّا يَزَّكَّىٰ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَن جَآءَكَ يَسۡعَىٰ ﴿٨﴾ وَهُوَ يَخۡشَىٰ ﴿٩﴾ فَأَنتَ
عَنۡهُ تَلَهَّىٰ ﴿١٠﴾ كَلَّآ إِنَّهَا تَذۡكِرَةٞ ﴿١١﴾ فَمَن شَآءَ ذَكَرَهُۥ ﴿١٢﴾ فِي صُحُفٖ مُّكَرَّمَةٖ
﴿١٣﴾ مَّرۡفُوعَةٖ مُّطَهَّرَةِۭ ﴿١٤﴾ بِأَيۡدِي سَفَرَةٖ ﴿١٥﴾ كِرَامِۭ بَرَرَةٖ ﴿١٦﴾ قُتِلَ ٱلۡإِنسَٰنُ
مَآ أَكۡفَرَهُۥ ﴿١٧﴾ مِنۡ أَيِّ شَيۡءٍ خَلَقَهُۥ ﴿١٨﴾ مِن نُّطۡفَةٍ خَلَقَهُۥ فَقَدَّرَهُۥ ﴿١٩﴾ ثُمَّ
ٱلسَّبِيلَ يَسَّرَهُۥ ﴿٢٠﴾ ثُمَّ أَمَاتَهُۥ فَأَقۡبَرَهُۥ ﴿٢١﴾ ثُمَّ إِذَا شَآءَ أَنشَرَهُۥ ﴿٢٢﴾ كَلَّا لَمَّا
يَقۡضِ مَآ أَمَرَهُۥ ﴿٢٣﴾ فَلۡيَنظُرِ ٱلۡإِنسَٰنُ إِلَىٰ طَعَامِهِۦٓ ﴿٢٤﴾ أَنَّا صَبَبۡنَا ٱلۡمَآءَ صَبّٗا
﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقۡنَا ٱلۡأَرۡضَ شَقّٗا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتۡنَا فِيهَا حَبّٗا ﴿٢٧﴾ وَعِنَبٗا وَقَضۡبٗا ﴿٢٨﴾
وَزَيۡتُونٗا وَنَخۡلٗا ﴿٢٩﴾ وَحَدَآئِقَ غُلۡبٗا ﴿٣٠﴾ وَفَٰكِهَةٗ وَأَبّٗا ﴿٣١﴾ مَّتَٰعٗا لَّكُمۡ
وَلِأَنۡعَٰمِكُمۡ ﴿٣٢﴾ فَإِذَا جَآءَتِ ٱلصَّآخَّةُ ﴿٣٣﴾ يَوۡمَ يَفِرُّ ٱلۡمَرۡءُ مِنۡ أَخِيهِ ﴿٣٤﴾
وَأُمِّهِۦ وَأَبِيهِ ﴿٣٥﴾ وَصَٰحِبَتِهِۦ وَبَنِيهِ ﴿٣٦﴾ لِكُلِّ ٱمۡرِيٕٖ مِّنۡهُمۡ يَوۡمَئِذٖ شَأۡنٞ
يُغۡنِيهِ ﴿٣٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ مُّسۡفِرَةٞ ﴿٣٨﴾ ضَاحِكَةٞ مُّسۡتَبۡشِرَةٞ ﴿٣٩﴾ وَوُجُوهٞ
يَوۡمَئِذٍ عَلَيۡهَا غَبَرَةٞ ﴿٤٠﴾ تَرۡهَقُهَا قَتَرَةٌ ﴿٤١﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَفَرَةُ ٱلۡفَجَرَةُ ﴿٤٢﴾

(٤٦) كاتێك كە زیندوكرانەوەو هاتنە مەیدانی كۆكردنەوە ژیانی دنیایان زۆر بەلاوە كەم دەبێت، وە وا دەزانن تاقێكی ئێوارە یان تاقێكی بەیانی لەسەر زەوی دا ژیاون، تاقی ئێوارە لە پاش نیوەڕۆیە تا ڕۆژئاوابونو تاقی بەیانیش لە ڕۆژهەڵهاتنەوەیە تا نیوەڕۆ. دەشگونجێت مەبەست لە مانەوەی ناو گۆڕ بێت كە هەیە بە هەزاران ساڵە مردووە لە گۆڕدایە، بەڵام كاتێك زیندو دەكرێتەوەو سەختیو درێژی ئەو ڕۆژە دەبینێت بەلایەوە وایە كە تاقێك لە گۆڕدا ماوەتەوە كە داستانی عوزەیر پێغەمبەرو ئەسحابو لكەهەف ئەم مانایە زیاتر دەچەسپێنێتو ئایەتی (١١٢و١١٣)ی سورەتی (المؤمنون) كە دەفەرموێ:﴿وتی: چەند ساڵ لەم زەوییەدا ژیاون؟ وتیان:ڕۆژێك یان هەندێ لەرۆژێك جا پرسیار لەوانە بكە كە حیسابزانن﴾ بۆ هەردوو بۆچونەكە دەبێتو هەر خوایش زانایە.

## ٨٠ سورەتی عەبەسە ٤٢

سورەتی عەبەسە كە هەشتاهەمین سورەتی قورئانە لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوە، چلو دوو ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین بیستو چوارەمین سورەتە كە پاش سورەتی(النجم)و پێش سورەتی(القدر) دابەزیوە. ئەم سورەتە بەم ناوانەیش ناوبراوە (الصاخة، السفرة، الأعمى ).

بەناوی اللّٰه ی زۆر بە سۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ناوچاوی دا بەیەكداو پشتی هەڵكرد.

(٢) لەبەرئەوەی كە كوێرێك هاتەلای، زۆربەی ئەم ئایەتانە سەبارەت بە عەبدوڵای كوڕی ئوموومەكتوم هاتوەتە خوارەوە: كە جارێكیان پێغەمبەرمان ﷺكۆمەڵێك لە پیاوماقوڵانی قوڕەیشی لە لابو، خەریكی قسەكردن بو لەگەڵیانداو چاوەڕوان بو موسڵمان ببن لەو كاتەدا (ئیبنو ئوممی مەكتوم) كە كابرایەكی كوێر بو هاتە خزمەتیو نەیزانی كێی لایەو وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێم بڵێ ئەوەی كە خوا پێی وتویت، پێغەمبەریش ﷺ لەم كاتەدا بڕینی قسەی خۆی پێخۆش نەبو، ئەویش هەر دەیوت فێرم بكە لەوەی كە بۆت هاتوە، پێغەمبەر ﷺ ناوچاوی دا بەیەكداو وەڵامی نەدایەوە، جا ئەم چەند ئایەتە دابەزیو فەرموی ناوچاوی دا بەیەكدا لەبەرئەوەی كە كوێرێك هاتە لای،

(٣) فەرموی: تۆ چی دەزانی بەڵكو ئەو دەیەوێت خۆی پاك بكاتەوە،

(٤) یان پەندو ئامۆژگاری وەربگرێت، جا بەو ئامۆژگاریو بیرخستنەوەیە سود وەربگرێت. وە هەروایش بو ئیبنو ئومی مەكتوم یەكێك لەو باوەڕدارانەی سەرەتای ئیسلام بو كەپێغەمبەر ﷺ چەندین جار لەكاتی دەرچونی بۆغەزاكان ئەوی لە شوێنی خۆیدا لە مەدینەدا بۆپێش نوێژی ئەوانەی كەدەمانەوە لەشار داناوە، وە لە شەڕی قادسیە كە لە سەردەمی عومەری كوڕی خەتاب لە نێوان موسڵمانانو فارسەكاندا ڕویدا بەشداری كردوە، كە هەندێك پێیان وایە هەر لەو شەڕەشدا شەهید بوە.

(٥) بەڵام ئەو كەسەی كە خۆی بێنیاز دەزانێت كە وتراوە ئوبەیەی كوڕی خەلەف بو،

(٦) تۆ خۆت بەوەوە خەریك دەكەیت؛ كە چی ئیمانیشی نەهێناو لە غەزای ئوحود دا كوژرا ئەم ئایەتە ئەوەمان فێر دەكات كەكارێكی زانراو بۆكارێكی خەیاڵی وازی لێ ناهێنرێت، هەروەها بەرژەوەندییەكی دیاری بۆ بەرژەوەندییەكی خەیاڵی وازی لێ ناهێنرێت، كە ئەمە یەكێك لە بنەماكانی فیقهی ئیسلامیە.

(٧) جا تۆ هیچ تاوانت لەسەر نیە لەسەر ئەوەی كە ئەو كابرایە خۆی لەبت پەرستیو لوت بەرزی پاك ناكاتەوە، واتە ئەوەی كە بانگەوازەكەی تۆ بەهیچ نازانێتو گاڵتەت پێدەكات تۆ خۆت

بەووەوە خەریك دەكەیتو بەتەمایت پاكی بكەیتەوە بەڵام ئەو خۆی لادەدات، جا تۆ ئەوەندە خۆت بەوكەسەوە خەریك مەكە كەخۆی پاك ناكاتەوە تۆ تاوانت چیە؟ چونكە تۆ هەر گەیاندنی ئەم پەیامەت لەسەرەو زیاتر بەدەم ئەو كەسانەوە برۆ كە بەدەمتەوە دێن بۆیە دەفەرموێ:

﴿٨﴾ جا ئەوەی كە بەپەلە دێتە لای تۆبۆ شارەزابون لەئایین،

﴿٩﴾ لەحاڵێكدا كە ئەو لەخوادەترسێو دەیەوێ خۆی لە خراپەو شیركو تاوان پاك بكاتەوە،

﴿١٠﴾ جا تۆ خۆت لەوە بێ ئاگا دەكەیت

﴿١١﴾ شتی وا نەكەیت، بەبێگومان كەئەم ئایەتانەی قورئان وەبیر هێنەرەوەو ئامۆژگارین، بەڵێ بەم شێوەیە پێغەمبەرمان ﷺ لەلایەن پەروەردگارەوە لۆمە كراوەو ئەم لۆمەكردنەیش لە قورئاندا چەند جار هاتوە وەك دەفەرموێ ﴿لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ﴾ (التحریم:١) وە ﴿مَا كَانَ لِنَبِيٍّ أَن يَكُونَ لَهُۥٓ أَسۡرَىٰ﴾ (الانفال:٦٧) وە ﴿لِمَ أَذِنتَ لَهُمۡ﴾ (التوبة:٤٣) ئەم لۆمەكردنەیش گەلێك بەسودە لەوانە: بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خوا پێغەمبەرەكەی خۆی ﷺ لەژێر چاودێری خۆیدا دایناوە و هەروا نەیسپاردوە بەخۆی هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ لە یەكێك لە نزاكانیدا دەفەرموێ:{ اللهمَّ لاتَكِلِني إلى نفسي طَرفَةَ عَين أبَدا/أحمد و ابوداود.حسنه‌الالبانی/ ئەی پەروەردگارم یەك چاوبرِوكەیەك نەمخەیتە دەست نەفسی خۆم} جا ئەمە بەهرەیەكی گەورەیە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ. ئەم لۆمەكردنانە دەبێت بەهۆی ئەوەی كە پێغەمبەر ﷺ زۆر ئاگای لەخۆی بێتو بزانێت كە حیسابی ئەو جیاوازە لە خەڵكی تر. ئەم لۆمەكردنە دەبێت بەهۆی ئەوەی كە خەڵك لەبارەی پێغەمبەرەوە ﷺ لە سنور دەرنەچن، چونكە كەسێك كە لۆمەكرا دیارە ئازاد نیەو سیفاتی خوایی پێنادرێت هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ لَا تُطْرُونِي كَمَا أَطَّرَتِ النَّصَارَى عيسَى ابْنَ مَرْيَمَ فَإِنَّمَا أَنَا عَبْدُهُ فَقُولُوا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ/ متفق علیه/ واتە: لە پێناسەو باسی مندا نابێت لە سنوری خۆم تێم پەرِێنن وەكو گاورەكان كە عیسای كوری مەریەمیان وا لێ كرد، من بێجگە لەوەی كە بەندەی خواو پێغەمبەری ئەوم شتێكیتر نیم، جا بڵێن بەندەی خواو پێغەمبەرەكەی} هەروەها ئەم لۆمەكردنانە دەبێت كار بكاتە سەر رەوشتی خاوەن باوەڕانو زیاتر خۆیان لە تاوانو خراپە بپارێزن، چونكە كاتێك پێغەمبەر ی خوا ﷺ لەسەر شتێكی ئاوا بچوك لۆمە دەكرێت دەبێت خەڵكی ترچۆن بن، باسكردنی ئەو شتانەی كە پێغەمبەر لۆمەی لەسەر كراوە ئەوە دەردەخات كە پێغەمبەرمان ﷺ دوچاری تاوانی گەورە نەبوە ئەگینا پەروەردگار لێی بێدەنگ نەدەبو. ئەم لۆمە كردنانە دەبێت بەهۆی ئەوەی كە بریارەكانی پێغەمبەرمان ﷺ و ئەوەیشی كە ئیجتیهادی بێت بێ هیچ رەخنەیەك وەربگیرێت، چونكە ئەگەر نەیپێكایە خوا ڕاستیەكەی بۆ دەردەخست وەكو لەم شوێنانەدا دەركەوتوە كەواتە هەرچی پێغەمبەرمان ﷺباسی كردوە بۆمان مادام جێگیر بوبێت كە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی : هەموی ڕاستەو بریاری خوایە كەواتە ﴿هەروەها لەخۆیەوە قسە ناكات وە ئەوەی كە ئەو باسی دەكات نیگایەو بۆی رەوانەدەكرێت﴾ (النجم:٣-٤) واتە: ئیجتیهادی پێغەمبەر ﷺ وەكو ئیجتیهادی موجتەهیدین نیە، چونكە هی ئەوان زیاتر لەو دنیادا راستیو دروستی دەردەكەوێت هەرچەند موجتەهید نەك موشتەهی هەر پاداشتێكی هەیە. وە ئەم لۆمەكردنانە بەڵگەیەكی زۆر بەهێزن لەسەر ئەوەی كە ئەم قورئانە قسەی پێغەمبەرمان ﷺ نیە چونكە هیچ كەسێكی پایەبەرز لۆمەی خۆی باس ناكات بۆ خەڵك، بۆیە هەر ئەم لۆمەكردنانە بووەتە هۆی باوەرِهێنانی گەلێك خەڵك، بەڵێ بەراستی ئەم قورئانە گەورەترین مامۆستاو گەورەترین ئامۆژگاریكەرە بۆ مرۆڤو ئەركی پێغەمبەریش ﷺ تەنها گەیاندنیەتی.

﴿١٢﴾ جا هەر كەسێك ئارەزۆی لێیە با ڕوو لەو قورئانە بكاتو سودی لێ وەربگرێتو یادی بكات،

﴿١٣﴾ كە لە چەند پەرِەیەكی رِێزلێنراو دایە،

﴿١٤﴾ بەرزكراوەتەوەو خاوەن شكۆیەو پاك كراوەیەلە هەمو كەمو كورِیو دەست لێدانێكی نادروست،

﴿١٥﴾ بە دەستی نێردراوانێكەوەیە كە ئەو نێردراوانە،

﴿١٦﴾ بەرِێزو چاكەكارن، ئەگەرچی ئەم وەسفانە بۆ قورئانە لە لەوحولەحفوزداو بۆ فریشتەكانە، بەڵام هەروەها پێویست دەكات رِێز لە قورئانو قورئان خوێنانی ڕاستەقینەو مامۆستایانی قورئان بگیرێت، ئینجا ﷻ پاش ئەوەی كە لۆمەی پێغەمبەرە خۆشەویستەكەی خۆی كردو تێیگەیاند كە ئەم قورئانە كەلامی خوایەو بۆ بەندەی خوا هاتوەو نابێت بۆ گەیاندن بەوان هیچ جیاوازییەك دابنرێتو باسی گەورەیو رِێزی قورئانی كرد ئەوسا لۆمەو سەرزەنشتی بێباوەرِان دەكاتو دەفەرموێ:

﴿١٧﴾ بمرێت مرۆڤ چ شتێك وای لێكردوە كە كافری بكاتو باوەرِ بەو كەسە نەكات كە دروستیكردوەو هەمو شتێكی ژیانی بۆ دابین

کردوه؛ هەندێك وشەی (مَآ أَكۡفَرَهُۥ) یان، بە فیعلی تەعەجوب مانا کردووە واتە: بمرێت مرۆڤ چ عەجایب کافرو بێ باوەڕێکە!

(١٨) ئەو زاتە بالادەستە مرۆڤی لە چ شتێك دروستکردوە؟ کە ئیستا ئاوا خۆبەزلزان‌و ناسوپاسە؟

(١٩) لەو ئاوەی کە لە پشتی پیاو دێتەخوارەوەو دەچێتە ڕەحمی ئافرەتەوە دروستی کردوە، جا ئەندازەگیری هەمو شتێکی ئەوی کردوە، لە شێوەو ڕەنگ‌وجۆرو ڕۆزی‌و ئیش‌و ماوەی ژیانی‌و چاکی‌و خراپی و خۆشی و ناخۆشی کە چەندەو چۆن دەبێت.

(٢٠) لە پاشان ڕێگای هاتنە دەرەوەی لە ڕەحمی دایکدا بۆ ئاسان کردوەو ڕێگای ڕاست‌و ناڕاستی بۆ ڕۆشن کردووەتەوە جا بۆ ئەو سەرنوشتەی کە دیاری کراوە بۆی ڕێی بۆئاسان کردوە. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { إعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ/متفق علیه/ ئیش بکەن ئەوسا ئاسانکراوە بوهەموان ئەوەی کەبۆی دروستکراوە}واتە هەرکەسێ بۆچی درستکراوە ئەوڕێگاو ئیش‌و کاری لەلا ئاسانە.

(٢١) لە پاشان دەیمرێنێت‌و ئینجا دەیخاتە ناو گۆڕەوە. واتە: پاش مەرگیش ڕێزی بۆ داناوەو نابێت وەکو باقی گیانلەبەران تەماشا بکرێت، بەڵکو پێویستە بشارێتەوە.

(٢٢) لە پاشان هەر کات ئارەزوی لێبێت زیندوی دەکاتەوە. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ : { كُلُّ ابْنِ آدَمَ تَأْكُلُهُ الأَرْضُ إِلَّا عَجْبَ الذَّنَبِ مِنْهُ خُلِقَ وَفِيهِ يُرَكَّبُ/متفق علیه/ هەموئەندامێکی نەوەی ئادەم دەڕزێت بێجگە لەکلینچکەی کە سەرەتا لەوێوە دروستکراوەو هەرلەوێشەوە پێك دەهێنرێتەوە}

واتە: تەواوی ئەندامەکانی نەوەی ئادەم دەڕزێت‌و وەك خاکی لێدێت بێجگە لەو ئێسقانە بچوکەی کۆتایی پشتی ئینسان کەهەروەکو خۆی دەمێنێتەوەو نەخاك‌و نە ئاگرو نەهیچ مادەیەکی تر کاری تێناکات، کە مرۆڤ لەو دروستکراوە لەسەرەتاوەو دووبارە لەوێوە دروست دەکرێتەوە. ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(٢٣) بەڕاستی مرۆڤ ئەوەی کە ﷲ فەرمانی پێکردوە تا ئێستا بەتەواوی ئەنجامی نەداوە، پاش ئەوە ﷲسرنجمان ڕادەکێشێت بۆ لای ئەو خواردن‌و خواردنەوانەی کە ئێمە ڕۆژانە دەیخۆین‌و دەفەرموێ:

(٢٤) دەی با مرۆڤ تەماشای ئەوخواردنەی خۆی بکات و بزانێت هەروا لەخۆیەوە دەبێت یان پەروەردگاری بۆی بەدیدەهێنێت؟ جا پێویستە مرۆڤ چاوی خۆی بکاتەوەو سوپاسی پەروەردگاری بکات لەسەر ئەو هەمو نیعمەتانەی کە بە بەلاش بە مرۆڤی بەخشیون وەك دەفەرموێ:

(٢٥) بەڕاستی ئێمە بە لێشاو ئاومان ڕژاندوەبەسەر زەویدا.

(٢٦) پاشان زەویمان بەگوێرەی پێویست لەت لەتکردوە،

(٢٧) ئینجا بەهۆی ئاوو لەتبونی زەویەوە دانەوێڵەمان لە زەویدا ڕواندوە.

(٢٨) هەروەها بەو ئاوە ڕوواندوومانە ترێ‌و شینایی.

(٢٩) وەزەیتون‌و دارخورمایش.

(٣٠) جا باخ‌وبێستانانی چڕو پڕیش.

(٣١) جامیوە بۆ خواردنی مرۆڤ و گیاو پوشیش بۆ خواردنی حەیوانات.

(٣٢) تا خۆتان‌و مەڕوماڵاتتان سودی لێ وەربگرێت، بەڵێ ئەوەی خوێنراپەوە ئەگەر بە چاکی تەماشای بکەین‌و جوان لە پەیدابونیان ورد ببینەوە، مادام تۆزێك هەستمان هەبێت دەبێت سەری بەندایەتی بۆ خوای داناو زاناو بەهێز نەوی بکەین‌و بڵێین: (يَا رَبَّنَا لَكَ الحمد كَمَا يَنبَغِي لِجَلالِ وَجهِكَ وَعَظِيمِ سُلطَانِكَ). پاش ئەمانە خوای داناو زاناو بەهێز سرنجمان بەرەو ڕوداوی گەورەو سامناکی قیامەت ڕادەکێشێت‌و دەفەرموێ:

(٣٣) ئەگەر هەر کاتێك ئەو دەنگە گەورەو سامناکە هات‌و خەڵکی زیندوکرانەوەو لە زەوی کۆکرانەوەدا کۆکرانەوە، بەڕاستی کاتێکی پڕ مەترسی‌و سەختە کە قورئان بۆمان باسدەکات‌و دەفەرموێ:

(٣٤) ئەو دەنگە پڕ مەترسیە لە ڕۆژێکدایە کە مرۆڤ لە براکەی ڕادەکات نەوەك داوای مافی خۆی لێ بکات.

(٣٥) جا نەك هەر ئەوە بەڵکو لە دایکی‌و لە باوکی ڕادەکات.

(٣٦) خۆ نەك هەر ئەوانە بەڵکو ڕادەکات لە خێزانەکەی‌و لە کوڕەکانی ئەوانەی کە لە دنیادا حەرام‌و حەڵاڵی بەلاوە گرنگ نەبو بەڵکو چاك کردنی باری ژیانی ئەوانی بە پێویست دەزانی وا ئەمڕۆ ڕادەکات لێیان نەوەك داوای مافی خۆیانی لێ بکەن‌و کاتەکە زۆرسەختە.

(٣٧) چونکە هەمو کەسێك لەوان لەو ڕۆژەدا لە بارو دۆخێکدایە کە بێنیازی کردوە لەوەی کە لە کەسی تر بپرسێتەوە، واتە

ئەوندە سەرقاڵی خۆیەتی كە نایپەرژێتە سەركەسی تر. ئیبنوعەباس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {تُحْشَرُونَ حُفَاةً عُرَاةً غُرْلًا فَقَالَتْ امْرَأَةٌ أَيُبْصِرُ أَوْ يَرَى بَعْضُنَا عَوْرَةَ بَعْضٍ قَالَ يَا فُلَانَةُ لِكُلِّ امْرِئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنِيهِ / الترمذي، صححه الألباني/ ئێوە ڕۆژی قیامەت كۆدەكرێنەوە لەحاڵێكدا كە روتو پێپەتیو خەتەنە نەكراون جا ئافرەتێك وتی: ئایا عەورەتی یەكتر دەبینین؟ جا پێغەمبەر ﷺفەرموی: ئەی فلانی: هەمو كەسێك لەوان لەو ڕۆژەدا لە بارو دۆخێكدایە كە تەنها سەرقاڵی خۆیەتی. جا ئەو كاتە ئەوخەڵكە دوو بەشن وەك دەفەرموێ:

(٣٨) دەموچاوانێك هەن لەو ڕۆژەدا كە زەردن وەكو زێڕ دەدرەوشێنەوە.

(٣٩) پێدەكەنێتو مژدە دەدات لە خۆشیاندا،وەكو لە سورەتی (حاقە)لە ئایەتی نۆزدەدا دەفەرموێ:﴿ ئەو كەسەی كە نامەی كردەوەكانی بە دەستی ڕاستی پێدرا هاوار دەكاتو دەڵێت: وەرن نامەی كردەوەكانی من بخوێننەوە﴾ جا سەبارەت بە بەشی دووهەمیش دەفەرموێ:

(٤٠) ئەوسا دەمو چاوانێك هەن كە تەپوتۆزی لێ نیشتوەو

(٤١) مۆنو تاریكە،

(٤٢) ئەوانە هەر كافرانی خراپەكار بون، (خوای گەورە لەو دەمو چاوە نورانیو شادو مژدەدەرانەمان دابنێت ئامین).

## سورەتی تەكویر ٨١ — ٢٩

سورەتی تەكویر كە هەشتاو یەكەمین سورەتی قورئانە، لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوەو بیستو نۆ ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین حەوتەمین سورەتەو پاش سورەتی (الفاتحة)و پێش (الأعلى) دابەزیوە. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {مَن سرَّهُ أن يَنظُرَ إلى يومِ القيامةِ كأنَّهُ رأيُ عينٍ فليقرأ ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴾ و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾ و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ / أحمد، صححه الألباني/ هەر كەسێك پێی خۆشە تەماشای ڕۆژی قیامەت بكات وەكو بە چاو ببینێت با سورەتی(تەكویرو ئینفیتاروئینشیقاق) بخوێنێت. لەسورەتی پێشودا باسی هەندێ لەروداوەكانی قیامەتی كرد جالەم سورەتەوسێ سورەتی پاشیشی چەندین جۆر لەروداوە سەختەكانی قیامەت باس دەكات.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بە سۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) هەر كاتێك ڕۆژ تاریك بو شەوقی نەماو پێچرایەوە.

سُورَةُ التَّكۡوِيرِ ٨١ — ٢٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ﴿٤﴾ وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ﴿٥﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ﴿٦﴾ وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ ﴿٧﴾ وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ ﴿٨﴾ بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ ﴿٩﴾ وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ﴿١٠﴾ وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ ﴿١١﴾ وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ ﴿١٢﴾ وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ ﴿١٣﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ ﴿١٤﴾ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلۡخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلۡجَوَارِ ٱلۡكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ إِذَا عَسۡعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبۡحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوۡلُ رَسُولٖ كَرِيمٖ ﴿١٩﴾ ذِي قُوَّةٍ عِندَ ذِي ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٖ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٖ ثَمَّ أَمِينٖ ﴿٢١﴾ وَمَا صَاحِبُكُم بِمَجۡنُونٖ ﴿٢٢﴾ وَلَقَدۡ رَءَاهُ بِٱلۡأُفُقِ ٱلۡمُبِينِ ﴿٢٣﴾ وَمَا هُوَ عَلَى ٱلۡغَيۡبِ بِضَنِينٖ ﴿٢٤﴾ وَمَا هُوَ بِقَوۡلِ شَيۡطَٰنٖ رَّجِيمٖ ﴿٢٥﴾ فَأَيۡنَ تَذۡهَبُونَ ﴿٢٦﴾ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمۡ أَن يَسۡتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾

سُورَةُ الانفِطَارِ ٨٢ — ١٩

(٢) جا هەر كاتێك ئەستێرەكان لێڵ بونوونبون.

(٣) وە هەر كاتێك چیاكان پاڵنران، جا ئەمە شتێكی هەروا ئاسانو بێدەنگ نیە كاتێك كە ئەو هەمو چیایە لە جێی خۆیان هەڵدەكەندرێنو وردو ڕێزاڵ دەكرێنو دەبن بە تۆز دەنگو هەرایەكی وا ڕودەدات كە هەمو گیانلەبەران دەترسنو جا بەهەرلایەكدا رادەكەنو دێن بەناویەكدا.

(٤) سا هەر كاتێك كە حوشترانی نزیك بەزان كە خۆشەویسترینو بەنرخترین ماڵەكانی عەرەبن بەرەڵاكرانو خاوەنی لە ترسا هۆشی بەلایانەوە نەما،

(٥) جا هەر كاتێك كە جانەورانی كێوی كۆكرانەوەو تێكەڵاو بون.

(٦) وە هەر كاتێكیش كە دەریا پڕ ئاوەكان هەڵگرێنران، جا لەو كاتەدا زەوی تا حەوت چینی لەت دەبێتو لەو كاتەدا بایەك دێتو هەمویان دەمرن.

(٧) جا هەر كاتێك گیانەكان كرانەوە لەشو زیندوكرانەوە، یان هەر كاتێك كەسێك لەگەڵ هاووێنەی خۆیداچاك لەگەڵ چاكو خراپ لەگەڵ خراپدا كۆكرانەوە.

(٨) وە هەر کاتێکیش ئافرەتی زیندەبەچاڵکراو پرسیاری لێکرا،

(٩) بێژرا بە چ تاوانێك کوژراوە؟ ئەمە یەکێك بو لە ڕەوشتە ناپەسەندەکانی سەردەمی نەفامی کابرا کچی خۆی هەر بە زیندویی چاڵی بۆ هەڵدەکەندو دەیخستە ناویەوەو خۆڵی بەسەردا دەدا لەبەرئەوەی کە عەیبو عاری نەیەتە سەر، بەڵام ئیسلام هاتو ئەو کارە ناپەسەندەی وەکو سەدان کاری ناپەسەندی تری سەردەمی نەفامی هەڵوەشاندەوە، تەنانەت خۆ بەرگریکردنی پیاو بۆ نەبونی منداڵ بە زیندەبەچاڵکردنی پەنامەکی ناوبراوە، وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ذَلِكَ الْوَأْدُ الْخَفِيُّ وَهُوَ الْمَوْؤدةُ سُئِلَت/ مسلم/ئەوە زیندو بەچاڵکردنێکی پەنامەکیە، هەرئەوەیە زیندوبەچاڵکراو کەپرسیاریان لێدەکرێت} ئاینی ئیسلام ئاوا مافی مرۆڤ دەدات هەر لەکاتی نوتفەییەوە دەیپارێزێتو ڕێگای ڕاستو ڕەوانی بۆ دیاریی دەکات، بەڵام ئەوانەی کە ئەمڕۆ لافی مافی مرۆڤ لێدەدەن هێشتا شەڕی پێستو شەڕی نەژادی بە شتێکی ڕەواو ڕاستی دەزانن و بەرنامەی لەباربردنیان هەیە (الاجهاض)! ئینجا ﷻ درێژە بە ڕوداوەکانی قیامەت دەداتو دەفەرموێ

(١٠) جا هەر کاتێك کە نامەی کردارەکان بڵاوکرانەوەوەهەر کەسێك نامەی کردەوەی درایە دەستی هەندێك بەڕاستو هەندێك بە چەپ.

(١١) وە هەر کاتێکیش ئاسمان لابراو پێچرایەوە.

(١٢) جا هەر کاتێك دۆزەخیش هەڵگیرسێنرا.

(١٣) وە هەر کاتێکیش کەبەهەشت نزیك کرایەوە بۆ بەهەشتیانو کاتێك کە ئەم دوانزە ڕوداوە گرنگە ڕویاندا،

(١٤) ئەوکاتە هەمو کەسێك دەزانێت چی ئامادەکردوە بۆ ئەو ڕۆژە چاك یان خراپ، زۆر یان کەم، وەك لە سورەتی (ال عمران) ئایەتی (سی)دا دەفەرموێ: ﴿ئەو ڕۆژە هەموکەسێك هەرچی چاکەیەکی کردوە بۆی ئامادە دەکرێت، هەروەها ئەوەش کەکردویەتی لەخراپە، جا ئەوکاتە ئاوات دەخوازێت کەماوەیەکی زۆر درێژ ببوایە لەنێوان خۆیو ئەو کردارە خراپانەی دا﴾

(١٥) دەگونجێت(لا) زیادەبێت، واتە سوێند بە خوننەس دەخۆم یان لای (نافیە) بێت، واتە سوێند ناخۆم بە خوننەس، چونکە هەر خۆی شایەتە لەسەر زانایی‌و دانایی‌و هێزی ﷻ ، وشەی (خنس) بە ئەستێرەو ئاسكو گا کێوی ماناکراوە، جا ئەستێرە هەموی بێت کە بە ڕۆژ نابینرێن یان ئەو ئەستێرە ناسراوانە بن، جا هەر کام لەوانە بێت،

(١٦) هاتوچۆ دەکەن‌و دەچنەوە جێگای خۆیان، وشەی (کنس) بە جێگای خۆشاردنەوەی جانەوەرە وەحشیەکان دەوترێ، کێ ئەوانەی فێری گەڕان‌و هاتوچۆو گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیانی کردوە؟ ئاشکرایە کەهەر خوای زاناو داناو بەهێزە ئەوەدەکات نەك کەسی تر، ئینجا دەفەرموێ:

(١٧) جا سوێند بە شەو کاتێك تاریك دەبێت.

(١٨) وە سوێند بە کاتی بەیانی کاتێك هەناسەدەداتو لە شەو جیادەبێتەوە، لێرەدا لەجیاتی (طلع) وشەی (تَنَفَّس)ی بەکارهێناوە، کە بەڕاستی هاتنی بەیانیان هەواو هەناسەیەکی جیاوازی وای هەیە کتوپڕ بێ کاتژمێر دەتوانرێت بزانرێت کە بانگی بەیانی‌و کاتی نوێژی بەیانی هاتوەو ئەو هەوایەش زۆر بەکەڵکە وەکو پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{اَللَّهُمَّ بارِكْ لأمّتي في بكُورها/ الترمذی.صحیحه الالبانی/ ئەی خودایە پیرۆزکەیت بۆ گەلەکەم لە بەیانیانیاندا} هەندێك خەوی پاش نوێژی بەیانی تاهەتاو کەوتنیان بەلاوەچاك نیە، لەبەر ئەو ڕیوایەتانەی کەلەم بارەوە هاتون، جا خوای زاناو دانا سوێند بەوانە دەخواتو دەفەرموێ:

(١٩) بەڕاستی ئەم قورئانە قسەی ڕەوانەکراوێکی بەڕێزە کە هەرگیز خۆی لە قسەی بچوكو نارێك نادات، کەئەم قورئانەی لەبەیتولعیزەتەوە بەفەرمانی خوا گەیاندۆتە محمد ﷺ.

(٢٠) کەخاوەنی هێزەو لەلای خاوەنی عەرش بە شکۆو پایەبەرزە.

(٢١) کەبەگوێکراوە لەناو فریشتەکانداو لەوێدا بەدەمەو دەست پاك دەیناسن، مەبەست جبرەئیلە کە نێردراوێکە لەنێوان خواو پێغەمبەرماندا ﷺ و کەلامی خوای هێناوە بۆ پێغەمبە رمان ﷺ و خاوەن هێزە کەهیچ شتێك ناتوانێت دەست بخاتە ناوکاریەوەو ئەمینەو بە ڕێك‌وپێکی پەیامەکەی گەیاندوە، ئینجا دەفەرموێ:

(٢٢) وەبەڕاستی هاورێکەی ئێوە کە محمدە ﷺ شێت نیەو قسە لە خۆیەوە ناکات بەڵکو

(٢٣) بەڕاستی لەسەر سەریەوە بە ڕۆشنی جبرەئیلی بینیوە، ئەمە یەکەم بینین بو کە لەناو بەردەڵانەکانی مەکەدا چاوی پێکەوت، وا دەردەکەوێت کە ئەم سورەتە بەر لە ئیسرا بوە، چونکە لەکاتی میعراجدا جارێکی تربینیویەتی وەك خۆی ئەگینا

سەدان جاری تر بینیویەتی، بەڵام هەر جارێك بە شێوەیەك بوە کە هەندێك جار لە شێوەی (دحیەی کەلەبی)دا بوە.

(٢٤) وە ئەو محمده ﷺ سەبارەت بەو شتە نهێنیانەی کە بۆی هاتوە ڕژدە نیەو بە هەمو کەسێکی ڕاگەیاندوەو هیچ شتێکی نەشاردوەتەوە، وشەی (بِضَنِينٍ) بە (ظَنِين) خوێنراوەتەوەکە هەر دوو شێوەکە ڕەوایە واتە هیچ گومانێکی لێ ناکرێت.

(٢٥) جا ئەو قورئانە قسەی شەیتانی تارێنراو نیەو ناتوانێت شتێك لەو بارەوە بڵێت، وەك لە سورەتی (شوعەرا) ئایەتی (دووسەدوپانزەودووسەدودوانزە) دا دەفەرموێ: ﴿شەیتانەکان نەیانهێناوەو بۆیان نیە کەشتی وا بکەنو ناشتوانن، چونکە بێگومان ئەوان بەرگری کراون لە گوێگرتن﴾ ئینجا دەفەرموێ:

(٢٦) جا ئیتر بۆ کوێ دەچنو بۆ عەقڵتان ناخەنە کار تا ڕاستیەکان بزانن؟

(٢٧) ئەم قورئانە بێجگە لەوەی کە پەندو ئامۆژگاریە بۆ هەمو خەڵك شتێکی تر نیە.

(٢٨) بۆ هەر کەسێك کە بیەوێت ڕێگای ڕاست بگرێت ئەم قورئانە ڕێنمایی دەکاتو ڕێگای ڕاستی پیشان دەدات.

(٢٩) خۆ ئێوە ویستو ئارەزۆی هیچیش ناکەن مەگەر بە ویستی خوای پەروەردگاری جیهانیان بێت، پێویستە بزانرێت کەئایەتی پێشو بەرپەرچدانەوەیەکە بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان بە سەرپشکیو ئیختیاری مرۆڤ نیە وە ئەم ئایەتەش ڕەدە بۆ ئەوانەی کە پێیان وایە کە هەمو شت بە ویستو ئیختیاری مرۆڤە، بەڵام ئەهلی سوننەو جەماعە باوەڕیان بە هەردوو ئایەتەکە هەیەو هەرکام لەجیگای خۆیدا مانای دەکەنەوەو دەزانن خاوەنی ویستی بێ قەیدو شەرت هەراللە یەو ویستی مەخلوقاتیش لەژێر ویستی پەروەردگاردایە، دەشزانن کە زۆر جیاوازی هەیە لە نێوان ئیرادەو موحەبەتدا، لێرەدا پێویستە بزانین کە باوەڕبون بە قەزاو قەدەر یەکێکە لە بناغەکانی باوەڕی ئیماندار، بەڵام یەکێکە لەو بناغانەی کە قسەی زۆری لەسەر کراوەو ناکۆکی زۆری لەسەر بوەو زۆرێك لەوبارەوە لەحەق لایان داوە، وە لە ڕاستی دا هۆی سەرەکی لادان لە حەق لە مەسئەلەی قەزاو قەدەردا دەگەڕێتەوە بۆ نەناسینی پەروەردگاری جیهانیان بە ناسینێکی شیاو، باوەڕبون بە قەزاو قەدەر ئەوەیە کە باوەڕدا، باوەڕی وابێت کە: پەروەردگار ئاگای لە هەموشت هەیەو زانیاریەکەی گەورەو بچوك، ئاشکراو پەنهان دەگرێتەوەو هیچ شتێك نیە مەگەر ئەوەی کەاللە لێی ئاگادارە، کە ئەمە بە پلەی (العلم) دەناسرێت عیلمێك کە نە نەزانی توشی دەبێتو نە لەبیرچونەوە لەناوی دەبات، پاشان باوەڕی وابێت کە پەروەردگار پاش ئەوەی کە عیلمی بە چەندیەتیو چونیەتی هەموشتەکان بوە پەنجا هەزار ساڵ پێش ئەوەی کە ئاسمانو زەوی دروست بکات هەموی نوسیوە کە ئەمە پلەی (الکتابە)یە، پێویستە ئەوەش بزانرێت کە نوسین چەند شێوازێکی هەیە، لەوانە نوسینێکی گشتی کە لە لەوحولمەحفوزدایە، وە نوسین تەمەنی واتە : ئەو نوسینەی کە کاتێك مرۆڤ لە ڕەحمی دایکی دایە دەنوسرێت، نوسینی ساڵانە کە ئەویش لە شەوی قەدردا دەنوسرێت، وەهەروەها نوسینی بەردەوامی ڕۆژانە، ئینجا باوەڕی وابێت هەمو شت لە ژێر ویستو ئیرادە پەروەردگار ڕودەداتو ئەوەی ئەو زاتە بییەوێت ڕودەداتو ئەوەی نەیەوێت ڕونادات، هەموبونەوەر موڵکی پەروەردگارە، جا چۆن دەگونجێت اللە لە موڵکی خۆی دا شتێك روبدات کە ئاگای لێی نەبێتو ویستی لەسەر نەبێت؟ پاشان باوەڕی وابێت کە بەدیهێنەری هەمو شت پەروەردگارە کە لەوانە ئەو ئیرادەو ئەو هێزەیە کە بە مرۆڤی بەخشیوە، جا ئەوە ڕودەدات بەدیهێنەرەکەی اللە ی باڵادەستە تەنانەت ئەو کردارانەی کە مرۆڤ ئەنجامیان دەدات ئەگەرچی بە ویستی خۆی دەی کات، بەڵام خالیقەکەی اللە یە چون هەمو کردەوەیەك سەرچاوەی لە دوو شتە: ـ

**یەکەم:** ویستو ئیرادە قەتعی،

**دووهەم:** هێزو توانایی تەواو، خالقی ئەم دووانەش هەر اللە یە. پێویستە بزانرێت لە نێوان خۆشەویستی(الْمُحِبَة ) لە گەڵ ویست (الْمَشِيئَة) وە هەروەها (ئیرادە)دا جیاوازی هەیە، کاتێك دەوترێت هەموشت بە ویستی پەروەردگار ڕودەدات مانای ئەوە نیە کە ئەو ڕوداوە یان ئەوشتە لە لایەن پەروەردگارەوە شتێکی چاكو پەسند کراوەو خۆشەویستە، تاوانەکان کە ڕودەدن لە ژێر ویستی پەروەردگاردایە بەڵام پەروەردگار ڕفیەتی لەو کردارانە واتە: ویستی پەروەردگار لەسەر هەمو ئەو شتانەیە کە ڕودەدەن بەڵام مەرج نیە هەمویان پەسەندکراوی لای پەروەردگاربنو لێیان ڕازی بێتو خۆشی بوێت، بەڵام وشەی ئیرادە هەر دوو ماناکە لەخۆی دا کۆدەکاتەوە، جا بۆیە ئیرادە کراوە بە دوو بەشەوە، بەشێك کە بەمانای ویست (الْمَشِيئَة) دێت کە بە ئیرادەی کەونی ناویان بردوە کە حەتمەن ڕودەدات واتە: کاتێك کە پەروەردگار ویستی لەسەر شتێك بو ئەوە حەتمەن ڕودەدات بەڵام مەرج نیە کە خوا پێی خۆش بێت، بەشێکی تر کە بە مانای خۆشەویستیو موحەبەتە: کە ئیرادەی شەرعی پێدەوترێت کە پەروەردگار بەوە ڕازیەو پێیخۆشە بەڵام مەرج نییە ئەمە حەتمەن ڕو بدات وەك

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ ﴿١﴾ وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ ﴿٣﴾ وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ ﴿٤﴾ عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ ﴿٦﴾ ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ ﴿٧﴾ فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ ﴿٨﴾ كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ ﴿٩﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ ﴿١٠﴾ كِرَامٗا كَٰتِبِينَ ﴿١١﴾ يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ ﴿١٢﴾ إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ ﴿١٣﴾ وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ ﴿١٤﴾ يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ ﴿١٥﴾ وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ ﴿١٦﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٧﴾ ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ ﴿١٨﴾ يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ ﴿١٩﴾

## سُورَةُ المُطَفِّفِينَ ٨٣ ١٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّلۡمُطَفِّفِينَ ﴿١﴾ ٱلَّذِينَ إِذَا ٱكۡتَالُواْ عَلَى ٱلنَّاسِ يَسۡتَوۡفُونَ ﴿٢﴾ وَإِذَا كَالُوهُمۡ أَو وَّزَنُوهُمۡ يُخۡسِرُونَ ﴿٣﴾ أَلَا يَظُنُّ أُوْلَٰٓئِكَ أَنَّهُم مَّبۡعُوثُونَ ﴿٤﴾ لِيَوۡمٍ عَظِيمٖ ﴿٥﴾ يَوۡمَ يَقُومُ ٱلنَّاسُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٦﴾

ئەوەی کە دەفەرموێ:﴿ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيۡكُمۡ/ ﷲ پێیخۆشە کە تەوبەتان لێوەربگرێت﴾

دیارە هەمو کەس تەوبە ناکات واتە ئیرادە لێرەدا ئیرادەی شەرعی پەروەردگارە جا بۆیە وشەی( يريد ) لە ئایەتەکەدا بە خۆشەویستی مانا کراوە. وەهەروەها پێویستە بزانرێت کە دەستگرتن بە ئەسبابەکانو باوەڕبون بەوەی کە مرۆڤەکان لەلایەن پەروەردگارەوە ئیرادەیان پێدراوە وسەرپشك کراون لە هەڵبژاردنی ڕێگایان، بەشێکە لە باوەڕ بون بە قەزاو قەدەر. کەواتە ئەگەر پیاوێك کەسێکی کوشت بەناڕەوا دەبێت باوەڕدار باوەڕی وابێت کە پەروەردگار لە عیلمی ئەزەلی خۆیدا ئاگای لەم ڕوداوەبوەو زانویەتی کە ڕودەداتو پەنجاهەزارساڵ پێش دروستکردنی ئاسمان زەوی لە لەوحولمەحفوزدا نوسیویەتی، وە کاتی ڕوداوەکە لەبەر حیکمەتانێك کە خۆی دەزانێت وە یان ڕەخساندنی دەرفەتێك بۆ تاقی کردنەوەی بەندە، هێز و ئیرادەی پێویستی بۆ ئەوڕوداوە پێداوە، جا کابرا بە هۆی بەکاربردنی ئەو ئیرادەو هێزەوە لە ڕێگایەکدا کە ﷲ پێی ڕازی نییە تاوانبارەو مافی تۆڵە لێوەرگرتنەوەی هەیە. جا لەم ئایەتەش دا پەروەردگار تێماندەگەیەنێت کە ویستو ئارەزۆی ئێوە بەستراوە بە ویستی ئەو زاتەوە، کەواتە دەبێت چاك گەردنکەچ ببنو ڕاست بکەن لەگەڵیدا تا خوا یارمەتیتان بداتو سەقامگیرتان بکات لەسەر ئایین، ئەم سەرپشکیەی ئێمە بڕیارێکی ئەزەلی خودایە واتە سەرپشکییەکەمان بەڵگەی سەربەخۆی بێسنور نیە، بەڵکو وەك باقی شتەکانی تر سنوری هەیە. ئەمە چاکبزانە بەسودە.

## ٨٢ سورەتی ئینفیتار ١٩

سورەتی (ئینفیتار) کە هەشتادودووهەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوەو نۆزدە ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزینیش هەر هەشتادودووهەمین سورەتەو پاش سورەتی (النازعات)و پێش (الانشقاق) دابەزیوە.

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {مَن سرَّهُ أن يَنظُرَ إلى يومِ القيامةِ كأنَّهُ رأيُ عينٍ فليقرأ ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ﴾و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ﴾و ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ / أحمد، صححه الألباني/ هەر کەسێك پێی خۆشە تەماشای ڕۆژی قیامەت بکات وەکو بە چاو ببینێت با سورەتی تەکویر وئینفتار و ئینشقاق بخوێنێت.}

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ هەر کاتێك کەئاسمان لەت بو.

﴿٢﴾ وە هەرکاتێك کە ئەستێرەکان هەڵوەرین.

﴿٣﴾ جا هەرکاتێك کەدەریاکان تێکەڵاو بەیەك بوونو تەقینەوەو بوون بە ئاگر.

﴿٤﴾ سا هەرکاتێکیش قەبرەکان سەروبن کرانو خەڵکەکەی ناویان زیندوکرانەوە.

﴿٥﴾ ئا ئەو کاتە هەمو کەسێك دەزانێت چی پێش خۆی خستوە لە کردەوەی چاکو خراپ وە چیشی بەجێهێشتوە، ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

﴿٦﴾ ئەی نەوەی ئادەم چ شتێك بو بەهۆی ئەوەی کە تۆ لەخۆبایی ببیت لەبەرامبەری پەروەردگاری خاوەن کەرەمتەوە؟ چی بوە بەهۆی ئەوەی کە تۆ شەرم نەکەیتو دژایەتی بکەیت؟ کام نیعمەت لەونیعمەتانەی کە لاتە لەچاووگوێو ژیری دەسکردەی خۆتەو بێ منەتیت لەو پەروەردگارە خاوەن کەرەمتە؟

﴿٧﴾ کەتۆی دروستکردو ڕێكوپێکی کردیتو باڵایەکی ڕاستی پێدایت لە جوانترین وێنەداو هەمو ئەندامەکانی لەشتی بەگوێرەی پێویستو هاوسەنگو دادگەرانە پێبەخشیت؟

(٨) لە هەر وێنەیەكداو بە كێت بجوێنێت لە باوكو دایكو خاڵو مامدا پێكی هێنایت، واتە ئەو كەسەی كە بەبێ هەڵبژاردنی تۆ بەهەر شێوەیەك كە خۆی ویستویەتی دروستی كردویتو بێ هەڵبژاردنی خۆت دەتمرێنێتو بێ هەڵبژاردنی خۆت جارێكی تر زیندوت دەكاتەوە، جا كەی ڕەوایە تۆ بۆ ئەو چەند ڕۆژەی كە بۆ تاقیكردنەوەت سەرپشكیت پێدراوە لەخۆت بایی ببیتو بەندایەتی ئەو پەروەردگارە نەكەیت؟!

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: { إذَا أَرَادَ اللهُ جَلَّ ذِكْرُهُ أنْ يَخْلُقَ النَّسَمَةَ فَجَامَعَ الْرَّجُلُ الْمَرْأَةَ طَارَ مَاؤُهُ فِي كُلِّ عِرقٍ وَعَصَبٍ مِنهَا فَإِذَا كَانَ يوم السابع أحضرَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ لَهُ كُلَّ عِرقٍ بَينَهُ وَبَينَ آدَمَ ثُمَّ قَرَأَ فِي أيِّ صُورَةٍ مَا شَاءَ رَكَّبَكَ / السلسلة الصحيحة/ هەر كاتێ ئەو ﷲ یەی كە یادی بەشكۆیە ویستی كەسێك دروست بكات، ئەو كاتەی كە پیاو لەگەڵ خێزانیدا هاوجێگا دەبێت، ئاوەكەی بەهەمو ڕەگـودەمارێكی لەشی ئافرەتەكەدا دەگەڕێت، جا كەڕۆژی حەوتەمی هات خوای دەسەڵاتداری بەشكۆ هەمو ڕەگێك لەنێوان ئەوو ئادەمدا كۆدەكاتەوە، پاشان ئەو ئایەتەی خوێندەوە﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ / لەچ وێنەیەكدا ئارەزوی لێبێت پێكەوەی دەنێت﴾ جا چونكە زۆربەی خەڵك پەیڕەوی ئایین ناكەنو دژایەتی خودا دەكەن، لێرەدا بە گشتی دەفەرموێ:

(٩) بەڕاستی بیر لەو پەروەردگارە ناكەنەوە، بەڵكو باوەڕناهێنن بە ڕۆژی دوایی، بۆیە وا بە جورئەت دەبن سەبارەت بە تاوانكردنو دژایەتی پەروەردگار، پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: {يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَّى تُعْجِزُنِي ابْنَ آدَمَ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ مِثْلِ هَذِهِ فَإِذَا بَلَغَتْ نَفْسُكَ هَذِهِ وَأَشَارَ إِلَى حَلْقِهِ قُلْتَ أَتَصَدَّقُ وَأَنَّى أَوَانُ الصَّدَقَةِ/ ابن ماجه، حسنه الالبانی / ﷲ ی بەدەسەڵاتو گەورە دەفەرموێ: تۆچۆن لەدەستی من دەردەچیت ئەی نەوەی ئادەم بەراستی من تۆم لەوێنەی ئاوەها ئاوێك دروستكردووە، جا كاتێ كە گیانت گەیشت بەمەو هیمای كرد بۆلای قورگی كە دەڵێیت: من چاكە دەكەم، جا كەی ئەوە كاتی چاكە كردنە؟} جا بۆئەوەی بیربكەنەوەو واز لە سەركەشی بهێنن،ﷲ دەفەرموێ:

(١١) بەڕاستی چاودێریكەرتان بە سەرەوەیە كە ئەوانە بەڕێزنو نووسەری كردارو وتارەكانی ئێوەن،

(١٢) كەدەزانن بەئەو شتانەی كە ئێوە دەیكەنو تۆماری دەكەن لە گەورەو بچوكو چاكو خراپ،جا ئەوان بەڕێزنو ئێوەش ڕێزیان لێبگرنو قسەو ئیشی خراپ مەكەنو ڕێزیان مەشكێنن، جا یەك لەو شایەتانەی ڕۆژی قیامەتیش ئەم فریشتانەن، ئەوان ئەوەی كە دەكرێت تۆماری دەكەن،

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إذَا مَرِضَ العَبْدُ قَالَ اللهُ لِلْكِرَامِ الْكَاتِبِينَ اكْتُبُوا لِعَبْدِي مِثْلَ الَّذِي كَانَ يَعْمَلُ حَتَّى أَقْبِضَهُ أَوْ أُعَافِيَهُ/صحيح الجامع / هەركاتێك بەندەیەك نخۆش كەوت ﷲ ﷻ بەوفریشتە نوسەرە بەڕێزانە دەفەرموێ: بۆبەندەم بنوسن وەك ئەوەی كە لەپێشدا كردویەتی هەتا گیانی دەكێشم یان چاكی دەكەمەوە}

ئینجا پەروەردگارمان پاداشتی چاكەكارو خراپەكار بە شێوەیەكی كورت باسدەكاتو دەفەرموێ:

(١٣)بەبێگومان چاكەكاران لەناو نازو نیعمەتدان.

(١٤) وە بێگومانیش تاوانباران لەناو دۆزەخدان.

(١٥) لەڕۆژی قیامەتدا دەچنە ناو یەوە

(١٦)وەئەوان لەو سزاو ئاگرە سەختە دوورنابنو هەمیشەو بێپسانەوە لەناو ئەو سزایەدانو نە دەمرنو نە ئاسودە دەبن.

(١٧)تۆ چی دەزانی ئەو ڕۆژی دینە چییە؟ دووبارە لەبەر گەورەییو سەختی ئەو ڕۆژە دەفەرموێ:

(١٨) پاشان تۆ چی دەزانی ئەو ڕۆژی دینە چییە؟ ئینجا مانای ڕۆژی دینمان بۆ دەكاتو دەفەرموێ:

(١٩) ئەو ڕۆژە ڕۆژێكە هیچ كەسێك خاوەنی هیچ شتێك نیە بۆ كەسێكی تر مەگەر ﷲ ماوە بداتو ڕازی بێت، هەروەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {يا فَاطِمَة بِنتَ مُحَمدٍ انقذي نَفسكِ مِن النَّارِ فَإنِّي واللهِ مَا أملِكُ لَكُم مِن اللهِ شَيئاً/ الشیخان/ ئەی فاتیمەی كچی محمد ﷺ خۆت بپارێزە لە ئاگر، ئەوسا بێگومان بەخوا قەسەم من خاوەنی هیچ شتێك نیم لەلایەن خواوە بۆ ئێوە} چونكە لەو ڕۆژەدا هەمو شت بە دەست خوایەو كەس توانای هیچی نیە تا ﷲ ماوە نەدات، ئەوەی ڕاستی بێت ئەمڕۆش هەمو شت هەربە دەستی خوایە، بەڵام بەو كەمە سەرپشكیە لەخۆمان بایی بوینو خۆمان بە خاوەنی شت دەزانین.

كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْفُجَّارِ لَفِى سِجِّينٍ ﴿٧﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا سِجِّينٌ ﴿٨﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٩﴾ وَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِّلْمُكَذِّبِينَ ﴿١٠﴾ ٱلَّذِينَ يُكَذِّبُونَ بِيَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿١١﴾ وَمَا يُكَذِّبُ بِهِۦٓ إِلَّا كُلُّ مُعْتَدٍ أَثِيمٍ ﴿١٢﴾ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِ ءَايَٰتُنَا قَالَ أَسَٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ كَلَّا ۖ بَلْ ۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿١٤﴾ كَلَّآ إِنَّهُمْ عَن رَّبِّهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّمَحْجُوبُونَ ﴿١٥﴾ ثُمَّ إِنَّهُمْ لَصَالُوا۟ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦﴾ ثُمَّ يُقَالُ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تُكَذِّبُونَ ﴿١٧﴾ كَلَّآ إِنَّ كِتَٰبَ ٱلْأَبْرَارِ لَفِى عِلِّيِّينَ ﴿١٨﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا عِلِّيُّونَ ﴿١٩﴾ كِتَٰبٌ مَّرْقُومٌ ﴿٢٠﴾ يَشْهَدُهُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢١﴾ إِنَّ ٱلْأَبْرَارَ لَفِى نَعِيمٍ ﴿٢٢﴾ عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٢٣﴾ تَعْرِفُ فِى وُجُوهِهِمْ نَضْرَةَ ٱلنَّعِيمِ ﴿٢٤﴾ يُسْقَوْنَ مِن رَّحِيقٍ مَّخْتُومٍ ﴿٢٥﴾ خِتَٰمُهُۥ مِسْكٌ ۚ وَفِى ذَٰلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ ٱلْمُتَنَٰفِسُونَ ﴿٢٦﴾ وَمِزَاجُهُۥ مِن تَسْنِيمٍ ﴿٢٧﴾ عَيْنًا يَشْرَبُ بِهَا ٱلْمُقَرَّبُونَ ﴿٢٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ أَجْرَمُوا۟ كَانُوا۟ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يَضْحَكُونَ ﴿٢٩﴾ وَإِذَا مَرُّوا۟ بِهِمْ يَتَغَامَزُونَ ﴿٣٠﴾ وَإِذَا ٱنقَلَبُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَهْلِهِمُ ٱنقَلَبُوا۟ فَكِهِينَ ﴿٣١﴾ وَإِذَا رَأَوْهُمْ قَالُوٓا۟ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَضَآلُّونَ ﴿٣٢﴾ وَمَآ أُرْسِلُوا۟ عَلَيْهِمْ حَٰفِظِينَ ﴿٣٣﴾ فَٱلْيَوْمَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنَ ٱلْكُفَّارِ يَضْحَكُونَ ﴿٣٤﴾

## ٨٣ سورەتی موتەفیفین ٣٦

سورەتی موتەفیفین کە سورەتی هەشتاو سێ هەمین سورەتی قورئانە، لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، سی‌و شەش ئایەتە، وتراوە یەکەمین سورەتە کە لە مەدینەدا دابەزیوە.

ئیبنوعەباس دەڵێت:{ لَمَّا قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ كَانُوا مِنْ أَخْبَثِ النَّاسِ كَيْلًا فَأَنْزَلَ اللَّهُ سُبْحَانَهُ وَيْلٌ لِلْمُطَفِّفِينَ فَأَحْسَنُوا الْكَيْلَ بَعْدَ ذَلِكَ/ابن ماجة، حسنه الألباني/ کاتێك پێغەمبەرمان ﷺ تەشریفی بردە مەدینە خەڵکی مەدینە لە پێوانەدا خراپترینی خەڵك بون، جا اللَّهُ پاكو بێ عەیبی بۆ ئەوزاتە سورەتی موتەفیفینی رەوانە کرد ئەوسا ئەوانیش پاش ئەوە لەپێوانەدا زۆر چاك بون}

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) وای بۆ تەرازو بازان،

(٢) ئەوانەی کە کاتێك بۆ خۆیانی دەکێشن بەتەواوی بەشی خۆیان وەردەگرن.

(٣) جا هەر کاتێکیش کە بۆ خەڵکی بپێون یان بۆ خەڵکی بکێشن بە سووکیو بە کەمی بۆیان دەکێشنو زیانیان لێدەدەن، هەروەها ئەوانەکە چاکەی خەڵك بە سوك تەماشا دەکەن، بەڵام بۆ خۆیان باشی دەپێونو عەیبی خۆیان لا گچکەیە، بەڵام هی خەڵکیان لا گەورەیە، ئەمانەش هەر تەرازو بازنو کیشانەو پێوانەیان سەروخوار زۆردەکات، ئەو گەلەی کە لەکاتی کێشانەو پێوانەدا زوڵم لە خەڵك بکات، پەروەردگار لە دنیاو دوارۆژدا تولەی لێدەکاتەوە، سزای دنیای ئەوەیە کە پێغەمبەرمان ﷺباسی دەکاتو دەفەرموێ: { وَلَمْ يَنْقُصُوا الْمِكْيَالَ وَالْمِيزَانَ إِلَّا أُخِذُوا بِالسِّنِينَ وَشِدَّةِ الْمُئُونَةِ وَجَوْرِ السُّلْطَانِ عَلَيْهِمْ /ابن ماجة، صححه الألباني/ هیچ گەلێك پێوانەو کێشانەیان کەم نەکردوەتەوە، مەگەر تۆڵەیان لێ وەرگیرابێت بە بێ بارانیو سەختی ژیانو ستەمی دەسەڵاتداران بەسەریاندا}

جا زاڵبونی دەسەڵاتداری زاڵم بەسەر گەلێکدا خۆی بەڵگەیە لەسەر توڕەیی پەروەردگار لەو گەلە، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { قالت بَنو إسرائيل يا ربِّ أنتَ في السَّماءِ ونَحن في الأرضِ فكيف لَنا أن نَعرفَ رضاكَ وَغضبَكَ ؟ قال : إذا رضيتُ استعملتُ عَنكم عليكم خيارَكم وإذا غَضبتُ إستعلمتُ عليكم شرارَكم/ ابن عساكر،حسنه الألباني/ بەنی ئیسرائیلی وتیان: ئەی پەروەردگارمان تۆ لەئاسمانیو ئێمە لەزەویداین جا چۆن بزانین بە رەزامەندی و توڕەیی تۆ؟ فەرموی: هەرکاتێك رازی بم باشەکەتان دەکەم بە سەرپەرشتتان و هەرکاتێکیش کە رقم بێت لێتان خراپترتان دەکەم بە سەر پەرشتتان}ئینجا پەروەردگار هەڕەشەی دوا رۆژیش لە تەرازو بازان دەکاتو دەفەرموێ:

(٤) ئایا ئەوان دڵنیا نین کە زیندو دەکرێنەوە ؛

(٥) بۆ رۆژێکی گەورە کە رۆژی قیامەتە؟

(٦) ئەو رۆژەی کە هەمو خەڵك لە پێشگای پەروەردگاری جیهانیاندا راوەوستنو بێجگە لە کرداو وتاری چاکیان هیچی تر ناگاتە فریایان، سەبارەت بە سەختی و گەورەییو پڕ مەترسی ئەو رۆژە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إذا كان يوم القِيامَةِ أدنيت الشَّمس مِن العِبَاد حتَّى يَكون قيد ميل أو ميلين فَتَصْهَرُهُمْ الشَّمْسُ فَيَكونون في العَرَق كَقَدر أعمَالِهم مِنهُم من يأخذه إلى عَقِبَيْهِ وَمِنهُم من يأخُذُهُ إلى حَقْوَيْهِ وَمِنهُم من يُلجمهُ إلجاماً / أحمد ومسلم / کاتێك کەرۆژی قیامەت هات رۆژ لە بەندەکانەوە بە ئەندازەی میلێك یان دوو میل نزیك دەکرێتەوە، جا رۆژ دەیانتوێنێتەوە ئەوسا هەموویان بەگوێرەی کردارەکانیان لەناو عارەقی خۆیاندان، هەیانە هەتا هەردوو پاژنەی گرتووە (هەیانە هەتا هەردوو ئەژنۆیەتی)و هەیانە هەتا دوخێنگەیەتیو هەیانە هەتا ناو دەمی وەکو لەغاو لەغاودەکرێت بە عەرەقی خۆی}

وە ئەو ماوەیەش لای کەم پەنجا هەزار ساڵ درێژەدەکێشێت وەکو لە فەرمودەی (صحيح)ی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتوە، ئینجا خوای

داناو خاوەن دەسەڵات دەفەرموێ: ﴿كَلَّآ﴾ ئەمەی باسکراو ئەوەیش کە دێت شتێکی ڕاستو دروستە.

(٧) بێگومان کەنامەی کرداری خراپەکاران لەناو (سجین)دایە. ئینجا دەفەرموێ:

(٨) چی شتێك تۆی تێگەیاندوە کە سجین چییە؟ واتە: شتێکی زۆر گەورەو گرنگە، هەندێك دەڵێن: لەژێر حەوتەمین تەبەقی زەویدایە. ئینجا باس لەو سجینە دەکاتو دەفەرموێ:

(٩) پەرتوکێکە کە دیاریکراوەو ژمارەو نیشانەی لەسەرەو هەمو تۆمارکراوە، جا کەس بۆی نیە کە گۆڕانکاری تێدا بکات.

(١٠) وای، واوەیلایە لەو ڕۆژەدا بۆ بێباوەڕان. کێن؟

(١١) ئەوانەن کە باوەڕ ناکەن بە ڕۆژی قیامەتو بە شتێکی پڕوپووچ یان شتێکی دووری دەزانن، ئینجا خوای دانا پێناسەی ئەو بێباوەڕانەش دەکاتو دەفەرموێ:

(١٢) خۆ بێباوەڕ نابێت بەو ڕۆژە بێجگە لە هەمو دەستدرێژکەرێك بۆ سەر ماڵو گیانو ناموسی خەڵكو تاوانبارێك لە وتارو نیەتی خراپدا واتە: مرۆڤی ڕەوشت بەرزو چاکەکارو نیەت پاك هەرگیز بێباوەڕ نابێت بەو ڕۆژە،

(١٣) جا ئەو مرۆڤە پەستە هەر کاتێك نیشانەکانی ئێمەی بەسەردا بخوێنرێتەوە دەڵێت : ئەوە داستانو قسەی پڕوپووچی پێشوانە.

(١٤) وانیە کە ئەو دەڵێت بەڵکو ئەو وتارو کردارە ناپەسەندانەی کە کردویانە دڵی ئەوانی داپۆشیوەو زاڵبوە بەسەریدا، چونکە هەر تاوانێك ئەگەر تەوبەی لێ نەکرێت دەبێت بە خاڵێکی ڕەشو دڵ دادەپۆشێت وەکو لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا ﷺ هاتووە کە دەفەرموێ:{إنَّ العبدَ إذا اذنب ذنباً كانت نُكْتَةً سَوْدَاءَ فِي قَلْبِهِ فإن تابَ مِنها صُقِلَ قَلْبُهُ وإن زادَ زادَت فَذلكَ قول الله ﴿كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾ /الترمذي،صححه الألباني/ بەڕاستی بەندەی خوا هەر کاتێك تاوانێکی کرد ئەوتاوانەدەبێت بە خاڵێکی ڕەش لەسەر دڵیدا، جا ئەگەر پەشیمان بویەوە لێی دڵی پاك دەبێتەوە، وە ئەگەر زیاتری کرد ئەو خاڵەش زیاتر دەبێت، جا ئەوەیە فەرمودەی خوا: ﴿وانیە کە ئەو دەڵێت بەڵکو ئەوەی کە کردویانە دڵی ئەوانی داپۆشیوە﴾} . ئینجا خوا دەفەرموێ:

(١٥) با ئەوان دڵنیابن کە بەڕاستی لە ڕۆژی قیامەتدا لە بینینی پەروەردگاری خۆیان بەرگری دەکرێنو نایبینن، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەن باوەڕان پەروەردگاری خۆیان دەبینن، چونکە خوا لۆمەی بێباوەڕان دەکاتو وەکو سزایەك دەفەرموێ: (پەروەردگاریان نابینن) جا ئەگەر خاوەن باوەڕانیش نەیبینن ئیتر تەنیا بۆ ئەوان باسدەکات؟ واتە مەفهومی ئەم ئایەتە دەبێت بە چەسپێنەری مەنتوقی ئایەتەکانی سورەتی قیامە کە دەفەرموێ: ﴿چەند ڕوو و دەمو چاوێك هەن کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەدرەوشێتەوە، چونکە تەماشای پەروەردگاری خۆیان دەکەن﴾. هەروەها چەندین فەرمودەی ڕاستی (المتواتر) هەن کە خوای گەورە هەم لە مەیدانی مەحشەرداو هەم لەناو باخو بێستانی بەهەشتدا دەبینرێت، (بەوشێوەی کەخۆی دەزانێت و لەموتەشابیهاتەو باوەڕمان پێی هەیە وەك هاتووە پرسیار ناکەین لەبارەیەوە) ئینجا ئەو بێباوەڕانە ڕاپێچ دەکرێن بۆ دۆزەخ بەڵام ئەوەندە پەستو بێ هێزو لاوازن لە بەردەستی مەئمورانی دۆزەخدا وەکو ئەوە وایە کە خۆیان بچنە دۆزەخەوە، بۆیە دەفەرموێ:

(١٦) لەپاشان خاوەنی ئەو دڵانە دەچنە ناو دۆزەخەوە.

(١٧) پاشان پێیان دەوترێت : ئەمە ئەو شتەبو کە ئێوە باوەڕتان پێ نەدەکرد، ئا بەم شێوەیە سەرەڕای سزاو تۆڵەی سەختیان تانەو تەشەریشیان لێدەدرێت، چونکە ئەوان لە دنیادا بێجگە لەوەی کە ناڕەحەتیو ئێشو ئازاریان بۆ موسڵمانان دروست دەکرد تانەو تەشەریشیان لێدەدان، جا هەروا لە ڕۆژی قیامەتدا بە وێنەی ڕەفتاری خۆیانیان لەگەڵدا دەکرێت، بەڵام لە ناڕەحەتیو سەختیدا وێنەی نیە، وەکو لە سورەتی (الفجر) ئایەتی بیست وپێنجو بیستو شەشدا دەفەرموێ: ﴿ئەو ڕۆژە هیچ کەسێك کەسێك سزا نادات وەکو سزای ئەو، وەهیچ کەسێك کەسێك نابەستێتەوە وەکو بەستنەوەی ئەو﴾. ئینجا با خاوەن باوەڕان بەگشتیو بازاڕیان بەتایبەت زیاتر وریای خۆیان بنو خۆیان لە ترازوبازی بپارێزن، چونکە تاوانەکەی هەمو کونوقوژبنێکی ژیان دەگرێتەوەو سزای توندی دوارۆژیشی بەشوێنەوەیە، ئینجا هەروەك باوی قورئانە کە باسی خراپانی کرد دێتە سەرباسی چاکانو دەفەرموێ:

(١٨) بەڕاستیو بێگومان ئەمەی کە باسی دەکرێت ڕاستو بەجێیە کە بەڕاستی نامەی چاکەکاران وا لەناو (عِلِّيِّينَ )دا.

(١٩) جا تۆ چیت پێ وتراوە لەبارەی عیلییندا؟ واتە: شتێکی زۆر گەورەو بەرێزەو لە بێخی عەرشو لەسەر ئاسمانەکانەوەیە.

(٢٠) ئەو پەڕاوەی چاکەکاران پەڕاوێکی دیاریکراوو ژمارە لێدراوەو ناگۆڕێتو زیاد و کەمی لێ ناکرێت، لاکو مۆرکراوەو هیچ کەسێك ناتوانێت دەستکاری بکات.

(٢١) ئەو فریشتە زۆر بەڕێزو نزیکانەی خوا لەلای دا ئامادەنو ئاگایان لێیەتیو شایەتی دەدەن لەسەر ڕاستیو دروستیو پاکیو چاکی ئەو تۆمارکراوە.

بەرائی کوڕی عازیب دەڵێت: تەرمی یەکێك لەپیاوانی ئەنصارمان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ برد بۆ گۆرستان کاتێك خرایە ناو گۆڕەوە، پێغەمبەر ﷺ دانیشتو ئێمەش هەمومان بێدەنگ دانیشتین، جا پێغەمبەرﷺ باسی چۆنیەتی سەرەمەرگی کافرو باوەڕداری کرد بۆ یارەکانی، ئەوسا لە باسی ڕۆحی باوەڕداردا فەرموی:
{فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلَا يَمُرُّونَ يَعْنِي بِهَا عَلَى مَلَإٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ إِلَّا قَالُوا مَا هَذَا الرُّوحُ الطَّيِّبُ فَيَقُولُونَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ بِأَحْسَنِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانُوا يُسَمُّونَهُ بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى يَنْتَهُوا بِهَا إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيَسْتَفْتِحُونَ لَهُ فَيُفْتَحُ لَهُمْ فَيُشَيِّعُهُ مِنْ كُلِّ سَمَاءٍ مُقَرَّبُوهَا إِلَى السَّمَاءِ الَّتِي تَلِيهَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ اكْتُبُوا كِتَابَ عَبْدِي فِي عِلِّيِّينَ وَأَعِيدُوهُ إِلَى الْأَرْضِ فَإِنِّي مِنْهَا خَلَقْتُهُمْ وَفِيهَا أُعِيدُهُمْ وَمِنْهَا أُخْرِجُهُمْ تَارَةً أُخْرَى/ جا بەرزی دەکەنەوەو بەلای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا ناڕۆن مەگەر پرسیار بکەنو بڵێن:ئەم ڕۆحە پاکە کێیە؟ جافریشتەکانی هاوڕێی دەڵێن: ڕۆحی فلانی کوڕی فلانە، بەجوانترین ناوێك کەلەدنیادا ناویان دەبرد هەتا دەیگەیەننە ئاسمانی دنیا، ئەوسا داوای کردنەوەی ئاسمانی بۆدەکەن، جابۆیان دەکرێتەوە ئەوسافریشتە پایەبەرزەکانی هەمو ئاسمانێك بەڕێی دەکەون، تا دەیگەیەننە ئاسمانی سەرخۆیان هەتا دەگەیەنرێتە ئاسمانی حەوتەم، لەوێدا خوای دەسەڵاتداری گەورە دەفەرموێ: نامەی بەندەم لە علیین دا تۆمار بکەن و بیگەڕێننەوە بۆ زەوی چونکە بەراستی من ئەوانم لەو دروستکردوەو بۆ ناو ئەو دەیانگێڕمەوەو لەوەوە جارێکی تر دەریان دەهێنمەوە}

پاشان پێغەمبەر ﷺ لەباسی ڕۆحی بێباوەڕدار فەرموی:
{فَيَصْعَدُونَ بِهَا فَلَا يَمُرُّونَ بِهَا عَلَى مَلَإٍ مِنْ الْمَلَائِكَةِ إِلَّا قَالُوا مَا هَذَا الرُّوحُ الْخَبِيثُ فَيَقُولُونَ فُلَانُ بْنُ فُلَانٍ بِأَقْبَحِ أَسْمَائِهِ الَّتِي كَانَ يُسَمَّى بِهَا فِي الدُّنْيَا حَتَّى يُنْتَهَى بِهِ إِلَى السَّمَاءِ الدُّنْيَا فَيُسْتَفْتَحُ لَهُ فَلَا يُفْتَحُ لَهُ ثُمَّ قَرَأَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ لَا تُفَتَّحُ لَهُمْ أَبْوَابُ السَّمَاءِ وَلَا يَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى يَلِجَ الْجَمَلُ فِي سَمِّ الْخِيَاطِ فَيَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ اكْتُبُوا كِتَابَهُ فِي سِجِّينٍ فِي الْأَرْضِ السُّفْلَى فَتُطْرَحُ رُوحُهُ طَرْحًا ثُمَّ قَرَأَ وَمَنْ يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنْ السَّمَاءِ فَتَخْطَفُهُ الطَّيْرُ أَوْ تَهْوِي بِهِ الرِّيحُ فِي مَكَانٍ سَحِيقٍ /أحمد، صححه الألباني/ جا بەرزی دەکەنەوەو بەلای هیچ کۆمەڵە فریشتەیەکدا ناڕۆن مەگەر پرسیار بکەنو بڵێن: ئەم ڕۆحە پیسە کێیە؟جا فریشتەکانی هاوڕێی دەڵێن: ڕۆحی فلانی کوڕی فلانە، بە ناشیرنترین ناوێك کە لە دنیادا ناویان دەبرد، هەتا دەیگەیەننە ئاسمانی دنیا، ئەوسا داوای کردنەوەی ئاسمانی بۆدەکەن، جا بۆی ناکرێتەوە، لە پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم ئایەتەی سورەتی ئەعراف خوێندەوە﴿ کەدەرگای ئاسمانیان بۆناکرێتەوەو ناچنە بەهەشتەوە هەتا حوشتر بەکونی دەرزیدا نەچێت﴾

جا خوای دەسەڵاتداری گەورە دەفەرموێ: نامەکەی لەسجین دا تۆمار بکەن لەلاخوارترین زەویدا، ئەوسا گیانەکەی فڕەدەرێت چۆن فڕەدانێك لە پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە:﴿هەرکەسێك هاوبەش دابنێت بۆ ﷲ وەکو ئەوە وایە کە لە ئاسمانەوە بکەوێتە خوارەوەو باڵندەکان پەلاماری بدەنێوگاڵ گاڵی بکەن یان با فڕەی بداتە جێگایەکی دورەوە کە نەدۆزرێتەوە﴾حەج/٣١.

(٢٢) بەڕاستی چاکەکاران وان لەناو نازو نیعمەتێکی گەورەدا

(٢٣) کە لە سەر تەختو کورسیە بەنرخەکان دانو تەماشای ئەو هەمو نازو نیعمەتانەی خوا دەکەن کە بەوانی بەخشیوە، لە هەمویان گرنگتر تەماشای ﷲ دەکەن کە بێباوەڕان لەو نیعمەتە بێوەرین.

(٢٤) هەر کاتێك تەماشایان بکەیت بەلگەی شادمانیو خۆشی لە ناو چاویاندا دەبینیت، ئەوەندە جێگایان خۆشەو دڵیان گەشەو بیریان ئارامە.

(٢٥) کە شەرابی بەهەشتیان پێدەدرێت ئەو شەرابەی کە نە دوچاری سەرئێشە دەبنو نە بێهۆش دەبنو نە کەف بەدەمو لێویاندا دێتەخوارەوە.

(٢٦) دوا تامەکەی میسکەو بە میسك مۆرکراوە، جا با کێبەرکێکەران بۆ ئەوە کێبەرکێ بکەن. ئینجا دەچێتەوە سەر باسی شەرابەکەو دەفەرموێ:

(٢٧) جا تێکەڵاوی ئەو شەرابەیە بەشێك لە تەسنیم، تەسنیم بەنرخترینو چاکترین خواردنەوەی بەهەشتە، بۆیە دەفەرموێ ئەو تەسنیمە،

(٢٨) چاوگەیەکەو خەڵاتی خاوەن باوەڕە پایە بەرزەکانە کە لەو دەخۆنەوە، بەڵام بە تێکەڵاوی شەرابی تر دەدرێت بە خاوەن باوەڕانی دەستە ڕاست (أصحاب اليمين) ئەمە قسەی ئیبنو عەباسو ئیبنو مەسعودو مەسروقو قەتادەو بێجگە لەوانیشە، ﷲ پاش ئەوەی دەنگ و باسێکی دۆزەخو دۆزەخیانو بەهەشتو بەهەشتیانی دا بەگوێی بیسەراندا، وا جارێکی تر دەمانهێنێتەوە بۆدنیاو بۆ بیستنی ڕەفتاری ناشیرینی تاوانباران و دەفەرموێ:

(٢٩) بێگومان ئەوانەی کە تاوانکاریان دەکرد، لەو کەسانە بون کە هەمیشە گاڵتەیان دەکرد بە باوەڕداران و پێیان پێدەکەنین.

(٣٠) جا هەر کاتێك بیاندایە بەلای خاوەن باوەڕاندا بڕۆو چاویان لێ هەڵدەقرتاندو بە شێوەیەکی ناشیرین تەماشایان دەکردنو تانەو تەشەریان لێدەدان.

(٣١) خۆ هەر کاتێکیش کە دەگەڕانەوە بۆ ناو ماڵو منداڵی خۆیان شانازیان دەکرد بەو تانەو تەشەرانەی کە دەیاندا لە خاوەن باوەڕان.

وشەی (فَكِهِينَ ) بە (فَاكِهِينَ)ش خوێنراوەتەوە واتە کاتێك کەدەگەڕانەوە بۆ ناو ماڵو منداڵو خێزانی خۆیان چیان داوابکردایە دەستیان دەکەوت ئەوەندە سەروەتو سامانیان هەبو، جا لەباتی شوکری خواو پەیڕەوی پێغەمبەرەکەی ﷺ دژایەتی خواو پێغەمبەر ﷺ و باوەڕدارانی ڕاستەقینەیان دەکردو خۆیان بە ڕاست دەزانی وەك دەفەرموێ:

(٣٢) جا هەر کاتێك ئەوان باوەڕدارانیان دەبینی دەیان وت: بەڕاستی ئەوانە سەرلێشێواوو گومڕان، بەڕاستی ئەم وەسفەی ناپاکانو تاوانبارانو بێباوەڕان وەسفێکی کۆنیانەو هەمیشە هەر بوەو هەر دەبێت، ئەوەتا ئەمڕۆ هەمو کارێکی دژی پاك داوێنی وەك نێربازیو زینا بە شتێکی شارستانی و پێشکەوتن دادەنێن، بەلام داپۆشینی ئافرەتوپاك داوێنی بە دواکەوتنو کۆنەپەرستی دادەنێن! شەڕ لەسەر زمانو خاكودزینی سامانی خەڵك بە مافی مرۆڤی دادەنێن، بەلام شەڕ لەسەر بیروباوەڕ بون بە خواوەرەوشتی بەرز بە تۆقێنەرو کۆنەپەرستیو نەزانی ناودەبەن، بەڕاستی گەلێکی چەواشەو لاسارن بە ئازادیو دیموکراتی گوێی عالەم کەڕ دەکەن، بەلام نابێت خەڵکی تر ئەگەر لەبەرژەوەندی ئەواندا نەبێت ڕەئی هەبێتو بتوانێت قسە بکات؟! بەڕاستی ئەمانە دژی هەمو باوو نەریتێکی چاکن، بەڵکو بە پێچەوانەوە بڵاوکەرەوەی هەمو باوو ڕەوشتێکی دژی مرۆڤ و ڕەوشتو خواناسین، بەلام ئەم سوك تەماشاکردنو گاڵتە کردن بە باوەڕداران نابێ ببێت بە هۆکارێك بۆئەوەی کە باوەڕدار ڕێی لێ ون ببێتو هەست بەکەمیو سەرشۆڕی خۆی بکات چونکە باوەڕدار پێی وایە کەپێوەری حەقو ناحەقی یان ڕاستیو ناڕاستی قسەی خەڵك نیە بەڵکو ئەوەی کەاللهو پێغەمبەرەکەی بە ڕاستیانداناوە هەر ئەوە حەقەو لە پاش حەقیش جگە لە گومڕایی وناحەقی شتێکی تر نیە، جا باوەڕدار دڵنیایە کە پەروەردگاری هەمو بونەوەری لەگەڵدایە، با هەمو بونەوەریش گاڵتەی پێبکەن، بەڵکو باوەڕی وایە ئەگەر کەسێك شیاوی گاڵتە پێکردن بێت ئەوە ئەو بێباوەڕانەیە کە دژ بە پەروەردگاری خۆیان ڕاوەستاونو دەیانەوێ ململانێ لە گەڵ ئەو زاتە باڵادەستەدا بکەن؟! جا چۆن باوەڕدار ئیتر خۆی بە خاوەن عیزەتو گەورە نەزانێت، یارانی پێغەمبەر ﷺ کاتێك کەئیمان لە ناو دڵکانیاندا چەسپا زلهێزانی ئەو کاتەیان لا گچکە بویەوە، دەبینین لە شەڕی قادسیەدا پێش ئەوەی کە شەڕەکە دەست پێبکات، فارسەکان داوایان کرد لە سوپای موسڵمانان کە نوێنەریکیان بۆ ڕەوانە بکەن تا لەگەڵیدا وتووێژ بکەن، جا سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، یەکێك لە یارەکان بەناوی ڕیبعی کوڕی عامیری بۆ ڕەوانەکردن، ڕیبعی بە جلێکی سادەوەو لەسەر ئەسپەکەی ڕۆیشت بۆلای ڕۆستەم کە فرماندەی سوپای فارسەکان بو، کە لەشوێنی تایبەتی خۆیدا بو کە هەمو جۆرە ڕازاوەیەکی تێدا بو کاتێك گەیشتە لایان ویستی بچێتە ژورەوە بۆلای ڕۆستەم، پاسەوانەکانی ئیزنیان پێنەداو وتیان: دەبێ چەکە کەت لەگەڵ خۆتدا نەبەیت، ئەویش وتی:{ إِنِّي لَمْ آتِكُمْ، وَإِنَّمَا جِئْتُكُمْ حِينَ دَعَوْتُمُونِي، فَإِنْ تَرَكْتُمُونِي هَكَذا وَإِلاَّ رَجَعْتُ/ من خۆم بۆ خۆم نەهاتوم من پاش ئەوەی کە ئێوە دەواتان لێکردوم هاتوم، جا ئەگەر دەهێڵن ئاوا دەچمەژورەوە ئەگینا دەگەڕێمەوە، جا ڕۆستەم وتی: ئیزنی پێبدەن، پاشان چوە ژورەوە ئینجا خۆی دا بە ملی نێزەکەیدا، ئەوسا ڕۆستەم پرسیاری لێکرد : کە چی ئێوەی هێناوە بۆ ئێرە؟ جا ئەویش وتی: بێگومان الله ئێمەی ناردوە تا ئەوکەسەی کە ئارەزۆی لێبێت ڕزگاری بکەین لەبەندایەتی بەندەکان بۆ بەندایەتی الله بەتەنهایی، لەتەنگی دنیا بۆ فرەوانی دوارۆژ و لەستەمی ئایینەکان بۆ دادپەروەری ئیسلام} دوای بیستینی قسە کانی ڕیبعی، ڕۆستەم دەوای لێکرد کە ماوەیەکیان پێبدات ئەویش وتی: تا سێ ڕۆژ دەتوانین ماوەت پێبدەین، جا ڕۆستم لێی پرسی بۆ مەگەر تۆ سەرۆکی موسڵمانانی؟ ئەویش وتی:{ نەخێر، بەلام موسڵمانان وەکو یەك لەشن کە کەمترین کەسیان دەتوانێت پەنا بدات بەسەر پایە بەرزترینیاندا} / البداية والنهاية/ بەڵێ باوەڕدار هەمو کات سیقەی تەوای بە بیروبۆچونی خۆی هەیەو شانازی پێوەدەکاتو بەو پەڕی شانازییەوە دەڵێت: من موسڵمانمو هەست بە سوکیو سەرشۆڕی ناکات با ڕوبەڕوی زلهێزانیش بێت.

(٣٣) لەحاڵێکدا کە ئەوانە ڕەوانە نەکراون بۆ سەر باوەڕدارانو چاودێری باوەڕداران نین و ئامۆژگاری باوەڕداران بەوان نەسپێرراوە، واتە ئەو تاوانبارانە ئاوا چاودێری باوەڕداران دەکەن، وەك ئەوەی کەهیچ ئیشو ئەرکێکیان جگەلەوە نیەو بە خۆیان ئەو مافە دەدەن کە چی بڵێنو چی بکەن، ئینجا قورئان هەر زۆر بەزوویی دوای ئەو قسە ناپەسەندەی تاوانباران سەبارەت بە باوەڕداران کردیان ئەمانباتەوە بۆ ماڵی هەتا

عَلَى ٱلۡأَرَآئِكِ يَنظُرُونَ ﴿٣٥﴾ هَلۡ ثُوِّبَ ٱلۡكُفَّارُ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ﴿٣٦﴾

٨٤ سُورَةُ الانشِقَاقِ ٢٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ ﴿١﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٢﴾ وَإِذَا ٱلۡأَرۡضُ مُدَّتۡ ﴿٣﴾ وَأَلۡقَتۡ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتۡ ﴿٤﴾ وَأَذِنَتۡ لِرَبِّهَا وَحُقَّتۡ ﴿٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَىٰ رَبِّكَ كَدۡحٗا فَمُلَٰقِيهِ ﴿٦﴾ فَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ ﴿٧﴾ فَسَوۡفَ يُحَاسَبُ حِسَابٗا يَسِيرٗا ﴿٨﴾ وَيَنقَلِبُ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورٗا ﴿٩﴾ وَأَمَّا مَنۡ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ وَرَآءَ ظَهۡرِهِۦ ﴿١٠﴾ فَسَوۡفَ يَدۡعُواْ ثُبُورٗا ﴿١١﴾ وَيَصۡلَىٰ سَعِيرًا ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ كَانَ فِيٓ أَهۡلِهِۦ مَسۡرُورًا ﴿١٣﴾ إِنَّهُۥ ظَنَّ أَن لَّن يَحُورَ ﴿١٤﴾ بَلَىٰٓۚ إِنَّ رَبَّهُۥ كَانَ بِهِۦ بَصِيرٗا ﴿١٥﴾ فَلَآ أُقۡسِمُ بِٱلشَّفَقِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيۡلِ وَمَا وَسَقَ ﴿١٧﴾ وَٱلۡقَمَرِ إِذَا ٱتَّسَقَ ﴿١٨﴾ لَتَرۡكَبُنَّ طَبَقًا عَن طَبَقٖ ﴿١٩﴾ فَمَا لَهُمۡ لَا يُؤۡمِنُونَ ﴿٢٠﴾ وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُكَذِّبُونَ ﴿٢٢﴾ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا يُوعُونَ ﴿٢٣﴾ فَبَشِّرۡهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٢٤﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونِۭ ﴿٢٥﴾

هەتایی‌و دیمەنی خاوەن باوەڕو تاوانبارانمان دەخاتە پێش چاوو دەفەرموێ:

﴿٣٤﴾ جا ئا ئەمڕۆ (ئەو ڕۆژە گەورەیەی کەهەمو کەس دەبێ زیندو ببێتەوەو لەبەردەم دادگای خوادا بوەستێت‌و دادگایی بکرێت) ئەو ڕۆژە ئەوانەی کە باوەڕیان هێنابو بە بێباوەڕان‌و دەستەپاچەیی‌و سزای ناشیرینیان پێدەکەنن لە کاتێکدا کە باوەڕداران،

﴿٣٥﴾ لەسەر تەختی ڕازاوەن‌و شادمان‌و دڵخۆشن‌و تەماشا دەکەن، هەروەکو چۆن ئەوان لە دنیادا لەناو نازو نیعمەتدا بون‌و گاڵتەیان بە باوەڕداران‌و ژیان‌و گوزەرانیان دەکرد، ئینجا دەفەرموێ:

﴿٣٦﴾ ئایا کافران پاداشت نەدرانەوە لەسەر ئەو تاوانانەی کە کردیان دژ بەخاوەن باوەڕان؟ بەڕاستی توندترو سەخت تر لەوەی کە کردیان تۆڵەیان لێ سەنرایەوە.

٨٤ سورەتی ئینشقاق ٢٥

سورەتی ئینشقاق کە سورەتی هەشتاو چوارەمی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، بیست‌و پێنج ئایەتە،وتراوە بەگوێرەی دابەزین هەشتاو سێ هەمین سورەتەو پاش سورەتی (الانفطار)و پێش (الروم) دابەزیوە، لە ئەبو ڕافیعەوە هاتوە کە دەڵێت: نوێژی عیشام لەگەڵ ئەبو هورەیرەدا کرد کە ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ی خوێندو سوجدەی برد پێم وت: کە تۆ سوجدەت برد؟ ئەویش وتی: {سَجَدْتُ خَلْفَ أَبِي الْقَاسِمِ ﷺ فَلَا أَزَالُ أَسْجُدُ بِهَا حَتَّى أَلْقَاهُ / البخاري/ سوجدەم بردوە لە پشت ئەبوقاسمەوە ﷺ و هەر سوجدە دەبەم لەو سورەتەدا هەتا دەگەمەوە خزمەتی} لە ڕیوایەتێکی تردا کە موسلم‌و ئەبوداودو نەسائی لە ئەبوهورەیرەوە هێناویانە کە دەڵێت: {سَجَدْنَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي ﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنشَقَّتۡ﴾ و ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾ سوجدەمان برد لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ لەکاتی خوێندنی سورەتی ئینشقاق‌و عەلەقدا}.

بەناویﷲی زۆر بە سۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ هەر کاتێك ئاسمان لەت بو، جا ئەم لەتبونە چۆنیەتەکەی ڕوون نەکراوەتەوە پێویستە کەئێمە باوەڕمان بە لەتبونەکەی ببێت‌و واز لە چۆنیەتی لەتبونەکەی بهێنین، ئاسمان لەت دەبێت، چونکە فەرمانی ﷲیەو ئەویش وەکو باقی دروستکراوەکانی ﷲ فەرمانبەردارە،وەك دەفەرموێ:

﴿٢﴾ جا ئەویش گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاریەتی‌و پێویستکراوە لەسەری کە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەردار بێت، چونکە پەروەردگار گەورەیەکی وایە کە هیچ کەس توانایی بەرگری فەرمانەکانی ئەوی پێناکرێت، بەڵکو ئەو بەسەر هەمو شتێکدا دەسەڵاتدارەو خاوەنی هێزی بێسنورە، کەواتە مافی خۆیەتی ئاسمان گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەرداری بێت. ئینجا باسی ڕووداوێکی تری گرنگی کاتی هاتنی دواڕۆژ دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٣﴾ جا هەر کاتێك زەوی ڕاکێشراو بەرزو نزمی‌و چاڵ‌و چۆڵی تێدانەما، وەکو لە سورەتی (تاها/سەدوحەوت) دا دەفەرموێ: ﴿تۆ نابینیت کەبەرزی‌و نزمیەك لەو زەویەدا هەبێت﴾. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٤﴾ جا فڕەی دا ئەوەی کە تێیدایەو خۆی خاڵی کرد. واتە: هەمو مردوەکانی فڕەدایە دەرو زیندوکرانەوە، لێرەدا باس ناکات کە پاش ئەوە چی ڕوودەدات بۆ مرۆڤ، بەڵام لە سورەتی تەکویرو ئینفیتاردا دەفەرموێ:﴿هەموکەسێك دەزانێت چی ئامادە کردوە﴾ تەکویر/ ١٤. وە﴿هەمو کەسێك دەزانێت چی پێش خستوەو چی دواخستوە﴾ ئینفیتار/٥. دیسان دەفەرموێ:

﴿٥﴾ وە ئەویش گوێڕایەڵی فەرمانی پەروەردگاریەتی وپێویستکراوە لەسەری کە گوێڕایەڵ‌و فەرمانبەردار بێت.

﴿٦﴾ ئەی مرۆڤ بێگومان کە تۆ زەحمەتی خۆت دەدەیت‌و کۆششی زۆر دەکەیت‌و هەمیشەماندویت بە ماندوبونێکی

فرەوانو شەوو ڕۆژ بەدەم یەکەوە دەدەیت تا دەگەیتە پەروەردگارت، واتە تۆ تا دەمریت هەر خەریکی کارو کۆششیت، سەرئەنجام بەو کارو کۆششتەوە بە خوای خۆت دەگەیتو پاداشت یان سزای خۆت وەردەگریت. وەك دەفەرمویٚ:

﴿٧﴾ جا ئەو کەسەی کاری چاکی ئەنجامداوە لە دنیادا بە دەستی ڕاستی نامەی کردارەکانی پێدەدرێت،

﴿٨﴾ ئە وسا بەدوای ئەوەدا چەنو چونیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت.

﴿٩﴾ جا زۆر بە شادمانیو دڵخۆشیەوە دەگەڕێتەوە بۆ ناو خاوخێزانی لە بەهەشتدا، تەنانەت لە خۆشیدا ڕزگاربونی خۆیشی بەناو خەڵکدا جاڕدەدات وەك لە سورەتی حاقە/١٩ تا ٢٤، دا باسی کرد.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی مشتومڕی ڕۆژی قیامەتەوە فەرموی:{ مَنْ حُوسِبَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ عُذِّبَ قَالَتْ عَائِشَةُ أَوَ لَيْسَ يَقُولُ اللهُ ﴿فَسَوْفَ يُحَاسَبُ حِسَابًا يَسِيرًا﴾ قَالَ لَيْسَ ذَلِكَ بِالْحِسَابِ إِنَّمَا ذَلِكَ الْعَرْضُ وَلَكِنْ مَنْ نُوقِشَ الْحِسَابَ يَهْلِكْ/الجامع الصغيروصححه الالباني/ هەرکەس لەرۆژی قیامەتدا لێپیچنەوەی لەگەڵدا بکرێت سزادەدرێت، خاتون عائیشە وتی: ئەی خوا نافەرمویٚ: ﴿جا بەدوای ئەوەدا بگرەو بەردەیەکی ئاسانی لەگەڵدا دەکرێت﴾ فەرموی: ئەوەحیسابکردن نیە ئەوە هەر پیشاندانێکە، بەڵام هەر کەسێك چەندو چونی لەگەڵدا بکرێت دەفەوتێت}وەبە پێچەوانەوەی چاکانەوە، ئەوانەی کە لە دنیادا بێباوەڕبونو هەمیشە سەرگەرمی تاوانو خراپە بوون زۆر بە شێوەیەکی سەخت نوسراوەکەی خۆیانیان بەدەست دەگات وەك دەفەرمویٚ:

﴿١٠﴾ بەڵام ئەو کەسەی کە نامەی کردەوەکانی لە پشتیەوە پێدرا، لە سورەتی حاقەدا فەرموی: نامەی بەلای چەپدا پێدەدرێت، وامەزانە کە سێ تاقمن ئێرەو ئەویٚ زیاتر ڕۆشنکەرەوەی یەکترن، چونکە بێباوەڕانو تاوانباران دەستیان لە پشتەوە بەستراوە، کەواتە لە پشتەوە دەدرێتە دەستی چەپیان.

﴿١١﴾ئەوسا ئیتر ئەو تاوانبارە زۆر بەزوویی هاواری مردنو نەمان دەکات بۆ خۆی، بەڵام هیچ سودی پێنادات بەڵکو فریشتەکان گاڵتەیان پێدەکەنو دەڵێن:﴿داوای یەك لەناوچون مەکەن بەڵکو داوای لەناوچونی زۆربکەن﴾ فورقان:١٤ .

جا ئەم تاوانبارانە پاش ئەوەی کە نامەی کرداری خۆیانیان بەو شێوەیە وەرگرت خوا دەفەرمویٚ:

﴿١٢﴾دەخرێتە ناو دۆزەخەوە کە خاوەنی ئاگری بڵێسەدارە. ئینجا ﷲ پێناسەی ئەو تاوانبارانە دەکاتو ئیشەکانی دنیایان دێنێتە بەر چاو تا خەڵکی پەندو ئامۆژگاری لیٚ وەربگرنو تەماشای خۆیان بکەنو بزانن ئایا لەو وەسفە خراپانەیان تێدانیە؟ جا ئەگەر تێیاندا هەیە پێش ئەوەی بگەن بە ڕۆژێکی ئاوا سەختو بێدەرفەت وازی لیٚ بهێننو جێگای بە ئیشی چاك پڕ بکەنەوە، ئەمەش ئەو وەسفانەیە کە دەفەرمویٚ:

﴿١٣﴾ئەو تاوانبارە لە دنیادا لەناو خاوخێزانی خۆیدا شادمانو دڵخۆشبوە بەو تاوانو خراپانەی کە دەیکردن، وە ژیانی خۆشو نیعمەتی فرەوانی پێدرابو،

﴿١٤﴾بەبێگومان کەئەو گومانی دەکرد کە ناگەڕێتەوەو زیندو نابێتەوەو بگرەو بەردەی لەگەڵدا ناکرێتو کەس نیە ئاگای لەو بێتو تاوانەکانی تۆمار بکات، بۆیە خوا دەفەرمویٚ:

﴿١٥﴾وانیە کە ئەو گومان دەکات بەڕاستی پەروەردگاری ئەو چاوی لەوەو کردارەکانی دەبینێت. ئینجا ﷲسوێند بە سیٚ شت دەخوات کە گەورەترین بەڵگەن لەسەر دەسەڵاتو داناییو زانایی خوا، **یەکەمیان**:

﴿١٦﴾سوێند بەو سوراییەی کە پاش مەغریب دەست پێدەکاتو بە هاتنی کاتی عیشا کۆتایی دێت، **دووهەمیان** دەفەرمویٚ:

﴿١٧﴾وە سوێندیش بە شەوو ئەوەی کە شەو کۆیدەکاتەوە هەر لە کۆکردنەوەی ڕووناکی ڕۆژ هەتا کۆکردنەوەو گەڕاندنەوەی هەمو گیانلەبەرێك بۆ جێگای حەوانەوەی خۆی، **سێهەمیان** دەفەرمویٚ :

﴿١٨﴾ جا سوێند بە مانگیش کاتێك کە کۆدەبێتەوەو بە تەواوی پڕ دەبێت وەکو مانگی چواردەو پانزە، لەڕاستیدا ئەمانە لەلای هۆشیاران چەندین بەڵگەی ئاشکراو ڕونن لەسەر داناییو زاناییو دەسەڵاتی بێسنوری خوا، لە ڕاستیدا بەم ئالوگۆڕکردنە کۆتایی بە تەمەنی گیانلەبەرو جیهان دێت، واتە تۆ لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ئەی مرۆڤ ئەم شتانە بە چاوی خۆت دەبینیتو پەیدابونی ئەمانە بە شێوەیەکی ڕێكو پێكو بێوەستان بەڵگەی ئاوابونی ئارەزۆ و ئاواتەکانی تۆیەو تەواکەری تەمەنتن، واتە سوێند بەوانە،

﴿١٩﴾ ئێوە لە تەمەنتاندا بە چەند بارودۆخێکدا تێدەپەڕن، منداڵیو لاویو پیاویو پیریو خۆشیو ناخۆشی و مەرگ، پاش ئەوانەش زیندوبونەوەو لێپرسینەوەو سەرئەنجام بەهەشت یان دۆزەخ، جا ئێوە لەم قۆناغانەدا چەندین کۆسپی گەورەو بچوك دێتە ڕێگاتان کە ئێوە بە چاوی خۆتان یان بە گوێی خۆتان

٨٥ سُورَةُ البُرُوجِ ٢٢

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلۡبُرُوجِ ﴿١﴾ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡمَوۡعُودِ ﴿٢﴾ وَشَاهِدٖ وَمَشۡهُودٖ ﴿٣﴾ قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ﴿٤﴾ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ ﴿٥﴾ إِذۡ هُمۡ عَلَيۡهَا قُعُودٞ ﴿٦﴾ وَهُمۡ عَلَىٰ مَا يَفۡعَلُونَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ شُهُودٞ ﴿٧﴾ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٨﴾ ٱلَّذِي لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ﴿٩﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَتَنُواْ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَتُوبُواْ فَلَهُمۡ عَذَابُ جَهَنَّمَ وَلَهُمۡ عَذَابُ ٱلۡحَرِيقِ ﴿١٠﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡكَبِيرُ ﴿١١﴾ إِنَّ بَطۡشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ ﴿١٢﴾ إِنَّهُۥ هُوَ يُبۡدِئُ وَيُعِيدُ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلۡوَدُودُ ﴿١٤﴾ ذُو ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡمَجِيدُ ﴿١٥﴾ فَعَّالٞ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡجُنُودِ ﴿١٧﴾ فِرۡعَوۡنَ وَثَمُودَ ﴿١٨﴾ بَلِ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي تَكۡذِيبٖ ﴿١٩﴾ وَٱللَّهُ مِن وَرَآئِهِم مُّحِيطُۢ ﴿٢٠﴾ بَلۡ هُوَ قُرۡءَانٞ مَّجِيدٞ ﴿٢١﴾ فِي لَوۡحٖ مَّحۡفُوظِۭ ﴿٢٢﴾

٨٦ سُورَةُ الطَّارِقِ ١٧

لەخۆتانەوە بگرە تا کەس‌وکارو گەل‌و خەڵکانی تر دەبینن‌و دەبیستن، جا ئیتر بۆچی ئێوە ئەوەندە نەزانن‌و بیر لە پاشەڕۆژی خۆتان ناکەنەوە ؟

﴿٢٠﴾ ساچ شتێك بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەوان باوەڕ ناهێنن؟

﴿٢١﴾ خۆ هەر کاتێکیش کە قورئان بخوێنرێتەوە بەسەر ئەواندا ئەوان گەردنکەچ‌و گوێڕاڵی فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ نابن؟ واتە نەدەبو ئەوەندە لاسارو نەفام‌و نەزان بن. ئینجا دەفەرموێ:

﴿٢٢﴾ بەڵکو ئەوانەی کە بێ باوەڕبون قورئان بەدرۆ دەزانن بۆیە گوێڕایەڵی نابن‌و سودی لێ وەرناگرن.

﴿٢٣﴾ جا خوا زاناترە لە خۆیان بەوەی کە لەناو دڵیاندا کۆی دەکەنەوە دژی پێغەمبەر ﷺ و قورئان، وە هیچ خورپە دڵێکی لێ حەشار نادرێت چونکە دروستکەری خورپەکەش هەرخۆیەتی، جاچۆن دەگونجێت خۆی شتێك دروست بکات بەڵام پێی نەزانێت؟وەکو لە سورەتی مولك /١٤ دا دەفەرموێ: ﴿ئایا نازانێت بەوەی کە دروستی کردوە لە حاڵێکدا کەئەو زۆر وردبین‌و بەئاگایە؟﴾ ئینجا بەشێوەی گاڵتەکردن بەو بێباوەڕانە دەفەرموێ:

﴿٢٤﴾ دەی مژدەیان پێبدە بە سزایەکی دەردناك. لە ڕاستیدا مژدە بۆ شتی خۆشە نەك بۆ شتی خراپ بەڵام چونکە ئەوان لە دنیادا بە تاوان‌و خراپەکاری شادمان‌و دڵخۆشبون دەبێت هەروایش دڵخۆشبن بە تۆڵەی تاوان‌و خراپەکاریەکانیان، جا ئەگەر دڵخۆشیش نەبن چارەیان چیە؟ ئاشکرایە خوای میهرەبان پاش باسی خراپان‌و تۆڵەیان هەمیشە باسی چاکان‌و پاداشتیان دەکات، ئەوەتە دەفەرموێ:

﴿٢٥﴾ تەنها ئەوانەی کە باوەڕیان هێنابێت‌و کرداری چاکیان کردبێت، ئەوانە وەکو بێباوەڕان تەماشا ناکرێن ، بەڵکو بە پێچەوانەوە پاداشتیان چەند بەرامبەری کردارەکەی خۆیانە، کەبۆ ئەوان هەیە پاداشتێکی هەرگیز دوا نەهاتو و نەبڕاوە. خوا بە لوتفت بەشدارمان بفەرمویت لەو پاداشتە.

## ٨٥ سورەتی بروج ٢٢

سورەتی بروج کە هەشتاو پێنجەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، بیست‌و دوو ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین بیست وحەوتەمین سورەتە، پاش سورەتی (الضحی)و پێش (التین ) دابەزیوە.

لەم سورەتەدا خوای بالادەست سرنجی خوێنەری ئەم سورەتە ڕادەکێشێت بۆ سێ داستانی گرنگ لە مێژوی مرۆڤدا کە داستانی **یەکەم**: باسی کۆمەڵە کەسێکە کە خۆگریان لەسەر ئایین‌و خواناسی کەم وێنەیە، **دووهەمیان**: باسی خراپترین کەس دەکات بەرانبەر بە پێغەمبەری سەردەمی خۆی‌و لەناوچونی بەو شتەی کە ئەو پێی دا دەنازی کە بەناوبانگە بە فیرعەون، وە داستانی **سێهەم**: داستانی گەلێکی زۆر لاسارو بەهێزە کە دژایەتی پێغەمبەرو موعجیزە گرنگەکەیان دەکرد کە خوا بە دەنگێك لەناوی بردن کە بە گەلی سەمودبەناوبانگن.

بەناوی اللّٰه ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ اللّٰه سوێند بە چەند شتێك دەخوات‌و دەفەرموێ: سوێند بەو ئاسمانەی کە خاوەنی چەندین بورجە. جا ئەو بورجانە بە مانای کۆشکی گەورەو پڕ نەخش‌و نیگار بێت، یان بە مانای ئەو دوانزە جێگایە بێت کە هەر جێگایەکی شوێنی هەڵهاتنی ڕۆژە لە مانگێکدا کە هەر سێ بورجی بە وەرزێك دەناسرێت‌و بەو هۆیەوە جەوی ئاسمان لە ساردی‌و گەرمی‌و مام ناوەندیدا دەبێت‌و هەر سێ مانگی ئاوو هەوای نزیك لەیەکە، جا هەر کامیان ببێت

بەڵگەی دەسەڵاتو زانایی‌و ئاگاداری بێسنوری خودایە، ئینجا دەفەرموێ:

(٢) وە سوێند بە ڕۆژی قیامەتیش کە بەڵێنی هاتنی دراوە.

(٣) وە سوێند بە خواو بە هەمو دروستکراوەکانی، یان سوێند بە ڕۆژی هەینی‌و ڕۆژی عەرەفە، یان بە پێغەمبەر و مرۆڤ و فریشتە کە لە راستیدا هەر یەکێك لەوانە شایەتەو شایەتی لەسەر دراویشە جا من یەکەمم بەلاوە نزیکترە، بۆیە پێشم خست لەوانی تر ئەگەرچی ئەوانیش هەریەکە بەڵگەی خۆی هەیە، جا پاش ئەوەی کە خوا سوێندی خوارد بەو شتانە سوێند لەسەر خوراوی باس نەکرد، بەڵام داستانی پاش ئەم سوێندانە وا پیشان دەدات کە سوێند لەسەرخوراو بەم شێوەبێت، سوێند بەوانە ئێوەی ئەی خەڵکی مەکەو، ئەی ئەوانەی کە ئەم پەیامەی خواتان پێدەگاتو پەیڕەوی ناکەن لەناو دەچن‌و سەختترین سزادەدرێن، ئەوەتە ئەوانەی پێش ئێوە هەروەك ئێوە لاساریان کردو پەیڕەوانی ئایینیان سوتاندن، جا ئێمەش ئاوا بە شایەتی ئەوەی کە ئەم قورئانەی بەسەردا دەخوێنرێتەوە چ باوەڕ پێبکەن‌و چ نەیکەن دەڵێین:

(٤) نەفرین لەوانەی کە چاڵیان هەڵکەندو خاوەن باوەڕانیان تێدا سوتاندن، واتە: ئەوانە ئیتر بۆ هەمیشە لەناو سزاو دۆزەخدا دەبن، چونکە ئەوە هەواڵێکی ڕاستەو لەلایەن خوا خۆیەوە هاتوەو ئەو کەسەیش کە خوا نەفرینی لێکرد تازە ڕزگاربونی نیە، وە ئەگەر ئەم هەواڵەیش بەمانای دوعاو نزایش بێت، ئینجا سەختترە چونکە کەسێك کە خوا نزای نەفرینی بۆ بکات کێ هەیە بۆی بپاڕێتەوەو عەفوی بکات؟. جا ﷲ باسی ئەو ئاگرە دەکات کە ئەو خاوەن باوەڕانەیان پێ سووتاندووە دەفەرموێ:

(٥) ئەوە ئاگرێك بو کە خاوەنی سوتەمەنی بو نەدەکوژایەوە، واتە ئەوەندە سووتەمەنیان بۆ ئامادەکرد بو لەگەڵ تێفرەدانی ئەو هەمو خاوەن باوەڕانەدا ئەو ئاگرە نە دەکوژایەوەو نە کز دەبو، ئەو کەسانەیش کە ئاگرەکانیان دەکردەوەو فەرمانی سووتاندنی خاوەن باوەڕانیان دەدا ئەوەندە دڵڕەق‌و بێ بەزەیی بون کاتێك کە ئەوانیان فڕەدەدایە ناو ئەو ئاگرەو دەسوتان،

(٤) ئا لەو کاتەدا ئەوان بە چواردەوری ئاگرەکەدا دانیشتبون‌و کەیفیان دەکرد بە سوتاندنی ئەو باوەڕدارانە، لە فەرمودەیەکدا هاتوە کە ئیمامی موسلم‌و بێجگە لەویش ڕیوایەتیان کردوە لە سوهەیبی ڕۆمیەوەو ئەویش لە پێغەمبەرەوە ﷺ کە فەرمویەتی: (لەپێش ئێوەدا پاشایەك هەبوە کە ساحیرێکی هەبوە بۆ جادو کردن، کاتێك ساحیرەکە پیر بوە بە پاشاکەی وتوە: کە من پیربووم‌و کاتی مردنم هاتوە، منداڵێکم بۆ بنێرە با فێری سیحری بکەم، پاشاکەیش منداڵێکی ناردە لای‌و ئەویش سیحری فێردەکردو لەنێوان ساحیرو پاشادا خواناسێك هەبووە ئەو منداڵەیش چوەتەلای کابرای خواناس‌و سەری سوڕماوە لە شێوەو لە قسەکانی، جا هەر کاتێك دەهاتە لای ساحیرەکە لێی دەداو دەیوت بۆ درەنگ دێیت؟ وە کاتێکیش دەگەڕایەوە ماڵ لە ماڵ لێیان دەدا دەیانوت بۆ درەنگ گەڕایتەوە؟ منداڵەکە شکاتی ئەم حاڵەی خۆی لەلای خواناسەکە کردو ئەویش وتی: هەر کاتێك ساحیرەکە ویستی لێت بدات بڵێ: لە ماڵەوە دوایان خستوم، وە ئەگەر لە ماڵەوە ویستیان لێت بدەن بڵێ: ساحیرەکە دوای خستوم. پێغەمبەر ﷺ فەرموی: لەناکاو ڕۆژێك ڕێیکەوت لە حەیوانێکی زۆر سامناك‌و گەورە کە ڕێگای لە خەڵکی گرتبو و توانای دەربازبونیان نەبو، جا منداڵەکە وتی: ئەمڕۆ تێدەگەم ئایا ئیشی خواناسەکە خۆشەویستە لەلای خوا، یان هی جادوگەرەکە (الساحر)؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: منداڵەکە بەردێکی هەڵگرت‌و وتی: ئەی خوایە ئەگەر ئیشی خواناسەکە خۆشەویستە بە لای تۆوەو پێی ڕازیتری ئەم حەیوانە بکوژە با ئەم خەڵکە بتوانن دەربازببن، جا بەردەکەی لێداو کوشتی‌و خەڵکەکە ڕۆیشتن، ئەوسا منداڵەکە ئەم هەواڵەی بە خواناسەکە گەیاندو خواناسەکەیش وتی: ئەی کوڕی خۆشەویستم ئەمڕۆ تۆ لەمن چاکتری، جا بەڕاستی تۆ تاقی دەکرێیتەوە، جا ئەگەر دوچاری سەختی هاتیت باسی من مەکە، ئینجا منداڵەکە کوێرو بەڵەك‌و باقی نەخۆشانی تری چارە سەر دەکرد، جا یەکێك لە هاونیشینانی پاشا کەکوێربو ئەم هەواڵەی پێگەیشتو بە سەوقاتیەکی زۆرو بەنرخەوە هاتەلای‌و وتی: چاکم بکەرەوە ئەوەی لێرەیە هەموی بۆ تۆ، منداڵەکە وتی: من ناتوانم کەس چاك بکەمەوە ئەوەی کە چاکی دەکاتەوە تەنها خوای بەدەسەڵاتو بەشکۆیە، ئەگەر باوەڕی پێدەهێنیت منیش دوعات بۆ دەکەم لای خواو ئەویش چاکت دەکاتەوە، کابرا باوەڕی هێناو ئەویش دوعای بۆ کردو چاوی چاك بویەوە، ئینجا هاتەوە لای پاشاو وەکو جارانی پێشو دانیشت‌و پاشا وتی: ئەی فلانە کەس کێ چاوی دایتەوە؟ ئەویش وتی: پەروەردگارم، پاشا وتی: من؟ ئەویش وتی نەخێر، پەروەردگاری من‌و پەروەردگاری تۆ ﷲ یە، وتی: تۆ بێجگە لە من پەروەردگارێکی ترت هەیە؟ ئەویش وتی: بەڵێ، پەروەردگاری من‌و پەروەردگاری تۆ ﷲ یە، جا هەستا سزای دا هەتا قسەی منداڵەکەی بۆ کرد، ئەوسا ناردی بەشوێن منداڵەکەداو وتی: ئەی کوڕی خۆم جادوی تۆ گەیشتوە بەو سنورەی کە تۆ کوێرو بەڵەك‌و ئەو نخۆشانە چاك بکەیتەوە؟!

وتی: من هیچ کەسێك چاك ناکەمەوە، ئەوەی کە چاکی دەکاتەوە تەنها خوای بەدەسەڵاتو بەشکۆیە. پاشا وتی: من؟ ئەویش وتی نەخێر، پاشا وتی: ئایا تۆ بێجگە لەمن پەروەردگارێکت هەیە؟ وتی: پەروەردگاری منو پەروەردگاری تۆ اللّٰه یە، ئینجا دەستی کرد بە سزادانی و وازی لێ نەهێنا تا قسەی خواناسەکەی کرد، ئەویشی بۆ هێنراو پێی وت: بگەڕێرەوە لەو ئاینەت، نەگەڕایەوە، جا مشارێ لەسەر سەری داناو کردی بە دوولەتەوەو وتی: بە کابرای کوێریش: بگەڕێرەوە لەسەر ئەو ئاینەت، ئەویش نەگەڕایەوە هەروا مشارێشی لەسەر تەوقی سەری ئەو داناو کردی بە دوولەتەوە، ئینجا وتی: بە منداڵەکە بگەڕێرەوە لەو ئاینەت، ئەویش بەگوێی نەکرد، جا بە چەند کەسێکدا ناردی بۆ سەر جێگایەکی زۆر بەرزو وتی: هەر کاتێك گەیاندتانە سەر بەرزترین جێگای داوای لێ بکەن کە پەشیمان ببێتەوە ئەگەر پەشیمان نەبویەوە هەوای دەنە خوارەوە، جا کاتێك بردیانە ئەو جێگایە کە بەتەمای خستنەخوارەوەی بون وتی: خوایە بمپارێزە لێیان بەو شێوەی کە خۆت ئارەزۆت لێیە، جا چیاکە جوڵێنراو ئەوان هەمویان کەوتنە خوارەوە، منداڵەکە هاتەوە لای پاشاو پاشایش وتی: هاورێیانت چیانکرد؟

وتی: خوا منی لەوان ڕزگارکرد، ئینجا لەگەڵ چەند کەسێکدا بە کەشتیەکی گەرودا ناردیو وتی: کاتێك گەیشتنە قووڵایی دەریا پێی بڵێن پەشیمان ببێتەوە، جا ئەگەر پەشیمان نەبویەوە فڕەیدەنە دەریا، ئەوانیش بردیانو کاتێك ویستیان فڕەیدەنە دەریا وتی: خوایە بمپارێزە لێیان بەو شێوەیەی کە خۆت ئارەزۆت لێیە، جا هەمویان خنکانو منداڵەکە هاتەوە لای پاشاو ئەویش وتی: هاورێیانت چیانکرد؟ وتی: خوا منی لەوان پاراست، ئینجا وتی بە پاشا تۆ ناتوانێت من بکوژیت، هەتا بەو شێوەیە نەکەیت کە خۆم پێت دەڵێم، ئەگەر تۆ بەو شێوەیەی کە من پێم وتیت ئیشتکرد دەمکوژیت، ئەگینا ناتوانیت بمکوژیت، پاشا وتی: کامەیە ئەوەی کە تۆ دەیڵێیت؟

وتی: خەڵك لە شوێنێکی بەرزایدا کۆبکەیتەوە لە پاشان بمبەستی بە دارێکەوەو تیرێك لەم جوعبەی خۆمە دەربهێنیتو لەپاشان بڵێیت (بەناوی (اللّٰه)وە کە پەروەردگاری ئەو منداڵەیە) جا ئەگەر تۆ ئاوەهات کرد ئەوە دەمکوژیت. پاشا بەو شێوەیەی کردو ئەو تیرەی نایەناو کەوانەکەیو وتی: بەناوی (اللّٰه) کە پەروەردگاری ئەو منداڵەیەو تەقاندییە منداڵەکەو دای لە بناگوێی (لە ڕووی دەمو چاویەوە کە زوڵفی پێ دەوترێت)و منداڵەکە دەستی لەسەر برینەکەی خۆی داناو گیانی دەرچو، ئیتر ئەو خەڵکەی کە چاویان لەو ڕووداوە بو وتیان: (آمَنَّا بِرَبِّ الغُلامِ/ باوەڕمان هێنا بە پەروەردگاری ئەو منداڵە) وترا بە پاشا پێم ناڵێیت تۆ لەچی دەترسیت؟ وەڵڵاهی ئەوەی لێی دەترسایت رویدا لێت، ئەو خەڵکە هەمویان باوەڕیان هێنا، جا پاشا فەرمانیدا لە شوێنی دەرچونی هەمو ڕێگاکانەوە چاڵ هەڵکەنراو ئاگری تێدا کرایەوە، جا وتی: هەر کەس لە ئاینەکەی خۆی پەشیمان بویەوە ئەوە وازی لێ بهێنن، ئەگینا بیخەنە ناو ئەو چاڵە ئاگرەوە، ئینجا ئەوانیش بۆ پارێزگاری لەبیرو باوەڕی خۆیان، جا خۆیان فڕەدەدایە ناو ئاگروە، ئینجا ئافرەتێك هات کە کوڕێکی شیرەخۆری پێبو خەریکبوو خۆی بگرێت لە چونەناو ئاگرەکە، ئەو منداڵەیش هاتە قسەو وتی: خۆ بگرە ئەی دایکی خۆم بەڕاستی تۆ لەسەر بیرو باوەڕێکی ڕاستیت. جا لە ڕیوایەتێکی تردا ترمزی دەڵێ: کاتێك کە پێغەمبەر ﷺ ئەو ڕووداوەی باسدەکردو تەواو بو دەیفەرمو خوای بەدەسەڵاتو بەشکۆ دەفەرموێ: ﴿قُتِلَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡأُخۡدُودِ ٤ ٱلنَّارِ ذَاتِ ٱلۡوَقُودِ﴾ هەتا دەگەیشتە ﴿ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ﴾ بەڵام منداڵەکە شارایەوە، دەڵێن لە زەمانی خەلافەتی عومەردا (خوا لێی ڕازیبێت) ئەو منداڵە دەرهێنرا ئەو هەر پەنجەکەی لەسەر بناگوێی بو، ئینجا اللّٰه بێ ڕەحمیو ناپاکی ئەو پاشایەو پەیڕەوانی باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٧) جا ئەوستەمکارانە خۆیان ئامادەبون لەوێدا کە ئەو باوەڕدارانەیان دەسوتاندن.

(٨) خۆ ئەوان ڕقیان نەبو لەو باوەڕدارانە، مەگەر تەنها لەسەر ئەوەبو کە ئەوان باوەڕیان هێنا بو بە خوای بە دەسەڵاتو سوپاسکراو، ئەگەرچی ئەمڕۆ خوا ئەو باوەڕدارانەی بەدەست ئەو تاوانبارانەوە گرفتار کردوە، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم دەبێ ئەو تاوانبارانەش بگەڕێنەوە بۆ دادگای اللّٰهو بە تۆڵەی ئەو تاوانانە، سزای سەختی دۆزەخ بچەژنو ئەو پیاوچاکانەیش بەهۆی ئەو سەختیەوە بەرزترین پلەی بەهەشت وەرگرن، واتە: بێباوەڕان بەهۆی کەمێك خۆشیو ڕابواردنو خۆسەپاندنەوە دوچاری سەختترین سزای دۆزەخ دەبنو خاوەن باوەڕانیش بۆ کەمێك سەختی دنیا بە بەرزترین و خۆشترین جێگای بەهەشت دەگەن، چونکە بێباوەڕان دژایەتی خوایەکی بەدەسەڵاتو بەشکۆ دەکەن،

(٩) ئەو زاتەی کە ئاسمانانو زەوی تەنها موڵکی ئەوە، خۆ اللّٰه ئاگای لە هەمو شتێك هەیە و هیچی لێ پەنا نادرێتو ئیشی کەسی لەلا ون نابێت، دەی خۆ ئەو زاتە بەدەسەڵاتە دەبینێت ئەو باوەڕدارانە چیان بەسەردێتو ئەو بێباوەڕانەش چ تاوانێك ئەنجام دەدەن ئایا دەگونجێت هەروا بڕوات؟ نەخێر، اللّٰه دەفەرموێ:

(١٠) بەبێگومان ئەوانەی کە ئەو باوەڕدارانەیان دوچاری بەڵا کردو سوتاندنیان لە پاشان تەوبەیان نەکردو پەشیمان نەبونەوە لەو تاوانە گەورەیەی کەکردیان ئەوسا بۆ ئەوان هەیە سزای دۆزەخو بۆ ئەوان هەیە سزایەکی سوتێنەر، حەسەنی بەسری دەڵێ: تەماشای ئەو ڕێزو سەخاوەتمەندیەی ﷲ بکەن، ئەوان دۆستانی خوایان شەهید کردوە، کەچی ﷲ بانگیان دەکات بۆ تەوبەو لێخۆشبون، ئینجا ﷲ باسی باوەڕدارانو پاداشتەکانیان دەکاتو دەفەرموێ:

(١١) بەڕاستی بۆ ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان ئەنجامداوە چەندین باخچە هەیە کە لەژێر ئەو باخچانەدا چەندین جۆگا دەڕوات.

جۆگای ئاوی خۆش، جۆگای شیری پاكو خاوێنو جۆگای شەرابی زۆر بەتامو جۆگای هەنگوینی پاڵفتەکراو ئەمانە هەمیشەو خاوەن باوەڕان لەناویدا دەخولێنەوەو بە ئارەزۆی خۆیان سودی لێ وەردەگرنو فریشتەکان پێیان دەڵێن: بخۆن نۆشی گیانتان بێت ئەوە بەرهەمی کردارەچاکەکانی خۆتانە، جا چ شتێك هەیە خۆشترو بەلەزەتترو بەنرختر بێت لەو نازو نیعمەتو جێگا خۆشەی خاوەن باوەڕان؟ زۆر جێگای خۆیەتی کە دەفەرموێ: ئا ئەوەیە خۆشبەختیو بەهرەی گەورە، ئینجا ﷲ ستەمکاران دەترسێنێتو دەفەرموێ:

(١٢) بەڕاستی لێدانی پەروەردگاری تۆ زۆر بەهێزو زۆر توندە.

ئینجا هەندێك شت باسدەکات کە بەڵگەی تواناییو هێزو زانایی بێسنوری ﷲیە، دەفەرموێ:

(١٣) بەبێگومان کە ئەو هەر خۆیەتی کە پێشەکی دروستکراوەکانی دروست دەکاتو دووبارە پاش مەرگیش وەك یەکەم جاریان لێدەکاتەوەو زیندویان دەکاتەوە بۆ حیسابو پاداشتو سزا، بەڕاستی ئەگەر دەسەڵاتدارو زانا نەبێت ناتوانێت ئەو هەمو ئێسكو پروسکەو ئەو هەمو جومگەو ڕەگو گۆشتو ئەو خەتەرە شاراوانەی ناو دڵ جارێکی تر بهێنێتەوە ڕوو بێ زیادوکەم تەنانەت سەرئەنگوشتەکانیش وەکو خۆی لێ بکاتەوە، بەڵێ ئەو زاتە هەروەك بە دەسەڵاتو زانایە،

(١٤) خۆ خۆیشی زۆر لێبوردەو و میهرەبانە سەبارەت بە هەمو دروستکراوەکانی، جا زاتێك ئاوا لە تاوانباران بە پەشیمانبونەوەیەك چاوپۆشی لێ بکات ئەی دەبێت لەگەڵ دۆستانی خۆیدا چی بکات؟

(١٥) بەڵێ ئەو زاتە خاوەنی عەرشێکی زۆر گەورەو بەرێزە، وشەی (الْمَجِيدُ) بە بۆری دالەکەو ژێری خوێنراوەتەوە **یەکەمیان** دەبێت بە وەسفی خواو خوای خاوەن عەرشو **دووەمیان** دەبێت بە وەسفی عەرشەکە وەکو مانامان کرد هەردووکیان ڕاستە. ئینجا دەفەرموێ:

(١٦) ئارەزۆی هەر شتێك بکات دەیکات. واتە هیچ شتێك ناتوانێت ببێت بە بەرپەرچ بۆ ئارەزۆکانی خواو کەس ناتوانێت دەست بخاتە کاروبارەیەوە،

دەڵێن ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت) لە نخۆشی مردندا بو پێی وترا ئایا پزیشك نەیبینیویت؟ وتی: بەڵێ، وتیان چی پێ وتیت؟ وتی: فەرمویەتی: (إِنِّي فَعَّالٌ لِمَا أُرِيدُ/ بەبێگومان من ئەوەی کە بمەوێ بیکەم دەیکەم). ئینجا دوو داستانەکەی ترمان بەکورتی بۆ باس دەکاتو دەفەرموێ:

(١٧) ئایا پێتگەیشتوە بەسەرهاتی سەربازەکان،

(١٨) فیرعەونو سەمود کە چیان بەسەرهات و چۆن تۆڵەیان لێ سەنرا لەسەر ئەو تاوانانەی کە دەیانکرد؟ ئایا هیچ کەس توانی ڕزگاریانی بکات؟ دەی ئێوەش ئەگەر زۆر ستەمکاربن هەروەکو فیرعەونتان پێدەکرێتو هەرچەند بەهێزبن هەروەکو گەلی سەمود دەبن، جا بۆ دەبێت بیر لەخۆتانو ئایندەتان نەکەنەوە؟ ئینجا دەفەرموێ:

(١٩) واز لە باسی ئەوان بهێنە، ئەوانەی کە بێباوەڕبون هەمیشە هەر خەریکی بەدرۆخستنەوەو سەرکەشیو لاساری بون،

(٢٠) جا با ئاگاداربن کە خوا بە زانینو بە دەسەڵات گەمارۆی داون و ناتوانن لە دەستی دەرچن.

(٢١) واز لەوەش بێنە، ئەوەی کە بۆتان دەخوێنرێتەوە قورئانێکی زۆر گەورەو بە عەزەمەتو بەرێزە،

(٢٢) کە لەناو لەوحێکدایە پارێزراوە لە هەمو زیادو کەمیو تێکدانو گۆڕانکاریەك، چۆنیەتی لەوحو جێگای بەڵگەی زۆر ڕونی لەسەر نیە ئێمەش پێویستە باوەڕمان پێی هەبێتو بەچاکی دەزانم واز لە چۆنیەتیو جێگای بهێنین، چونکە زانینی پێویست نیە ئەگینا ﷲ خۆی یان پێغەمبەرمان ﷺ باسیان دەکرد ئەگەر ئەو ڕیوایەتەی بەغەویو تەبەریش لە ئیبنوعەباسەوە هێناویانە ڕاست بێت باوەڕمان پێی هەیە.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ ﴿١﴾ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الطَّارِقُ ﴿٢﴾ النَّجْمُ الثَّاقِبُ ﴿٣﴾ إِن كُلُّ نَفْسٍ لَّمَّا عَلَيْهَا حَافِظٌ ﴿٤﴾ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ مِمَّ خُلِقَ ﴿٥﴾ خُلِقَ مِن مَّاءٍ دَافِقٍ ﴿٦﴾ يَخْرُجُ مِن بَيْنِ الصُّلْبِ وَالتَّرَائِبِ ﴿٧﴾ إِنَّهُ عَلَىٰ رَجْعِهِ لَقَادِرٌ ﴿٨﴾ يَوْمَ تُبْلَى السَّرَائِرُ ﴿٩﴾ فَمَا لَهُ مِن قُوَّةٍ وَلَا نَاصِرٍ ﴿١٠﴾ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ ﴿١١﴾ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ ﴿١٢﴾ إِنَّهُ لَقَوْلٌ فَصْلٌ ﴿١٣﴾ وَمَا هُوَ بِالْهَزْلِ ﴿١٤﴾ إِنَّهُمْ يَكِيدُونَ كَيْدًا ﴿١٥﴾ وَأَكِيدُ كَيْدًا ﴿١٦﴾ فَمَهِّلِ الْكَافِرِينَ أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا ﴿١٧﴾

٨٧ سُورَةُ الأَعْلَىٰ ١٩

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

سَبِّحِ اسْمَ رَبِّكَ الْأَعْلَى ﴿١﴾ الَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ ﴿٢﴾ وَالَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ ﴿٣﴾ وَالَّذِي أَخْرَجَ الْمَرْعَىٰ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُ غُثَاءً أَحْوَىٰ ﴿٥﴾ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَاءَ اللَّهُ ۚ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ وَنُيَسِّرُكَ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٨﴾ فَذَكِّرْ إِن نَّفَعَتِ الذِّكْرَىٰ ﴿٩﴾ سَيَذَّكَّرُ مَن يَخْشَىٰ ﴿١٠﴾ وَيَتَجَنَّبُهَا الْأَشْقَى ﴿١١﴾ الَّذِي يَصْلَى النَّارَ الْكُبْرَىٰ ﴿١٢﴾ ثُمَّ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿١٣﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾

## ٨٦ سورەتی تاریق ١٧

سورەتی تاریق کە هەشتاو شەشەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، حەڤدە ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سی‌و شەش هەمین سورەتەو پاش سورەتی (البلد)و پێش (القمر) دابەزیوە.

لەجابیری کوڕی سەمورەوە هاتوە کە: { أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقْرَأُ فِي الظُّهْرِ وَالْعَصْرِ بِالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ وَالسَّمَاءِ وَالطَّارِقِ وَشِبْهِهِمَا / الترمذي، الألباني : حسن صحيح/ بەڕاستی پێغەمبەری خوا ﷺ لە نوێژی نیوەرۆو عەسردا سورەتی بروج‌و تاریق‌و وێنەی ئەودوانەی دەخوێند}

لەم سورەتەدا خوای زاناو کاربەجێ پێشەکی سوێند بە ئاسمان‌و بەتاریق دەخوات‌و دەفەرموێت: بەسەر هەموکەسێکەوە چاودێرمان داناوەو،پاشان نەوەی ئادەم ڕادەوەشێنێت،و دەفەرموێت: تەماشای دروستکردنی خۆت بکەو بزانە ئەوەی کە بەو شێوەیە تۆی دروستکردوە، زیندوکردنەوەی دوبارەی تۆی لا زۆر ئاسانەو، لە پاشان جارێکی تر سوێند بە ئاسمان‌و ئیشە گرنکەکانی‌و زەوی‌و ڕووداوەکانی دەخوات،و دەفەرموێ: ئەم قورئانە جیاکەرەوەی ڕاست‌و ناڕاستەو نابێت بە دەستی کەم بگیرێت،لە کۆتاییدا هەڕەشەیەکی توند لە بێباوەڕان دەکات‌و مژدەیەکیش بە پێغەمبەر ﷺ و پەیڕوانی دەدات، ئەگەرچی سورەتێکی کورتە، بەڵام مرۆڤ لە دنیاوە بۆ قیامەت‌و لەجیهان خواناسیەوە بۆ خۆناسی دەبات‌و جارێکی تر دەیهێنێتەوە سەر زەوی‌و دۆستایەتی خۆی بۆ باوەڕداران‌و دژمنایەتیشی بۆ بێباوەڕان ڕادەگەیەنێت.

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ سوێند بە ئاسمان‌و سوێند بەتاریق. تاریق : بە هەمو شتێك دەڵێن کە لەناکاودا لە دەرگا بدات چ لە شەودابێت‌و چ لە ڕۆژدا بێت، بەڵام لێرەدا تایبەتی کردوەو پاشان مانای دەکات‌و دەفەرموێ:

﴿٢﴾ جا چی تۆی تێگەیاندوە کە ئەو تاریقە چیە؟

﴿٣﴾ ئەو تاریقە: ئەو ئەستێرەیە کە بە ڕووناکیەکەی تاریکایی شەو کون تێدەکات. ئاشکرایە بە پێشکەوتنی زانیاری ژمارەیەکی زۆر لە ئەستێرەکان بینران‌و گەورەیی‌و دووری ئەوان لە ئێمەوە دەرکەوت، هەیانە بە مەلاین جار لەم زەویەی کە ئێمەی بەسەرەوە دەژین گەورەترە، کە ئەوانەش هەمویان لەژێر ئاسماندا لە بۆشایدا دەسوڕێنەوە، دەی دەبێت ئاسمان چەند گەورە بێت، جا خوای زاناو بەدەسەڵات سوێند بەم دوو دروستکراوەی خۆی دەخوات کە بەڵگەن لەسەر بێسنوری زانایی‌و دانایی‌و دەسەڵاتی خۆی، سوێند دەخوات بەو دوو دروستکراوە گەورەو سەرسوڕهێنەرەو دەفەرموێ:

﴿٤﴾ هیچ گیانلەبەرێك نیە مەگەر لەسەر ئەو چاودێر هەبێت چ ئەوانەی کە دەیپارێزن‌و چ ئەوانەی کە پارێزەری قسەو کرداریان بن، وەکو لە سورەتی (ق)دا فەرموی (هیچ قسەیەك ناکات نەوەی ئادەم، مەگەر لای ئەو بێت ڕەقیب‌و عەتید)، ئینجا سرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت بۆ لای چۆنیەتی دروستبونی‌و دەفەرموێ:

﴿٥﴾ سا با مرۆڤ تەماشا بکات و بزانێت لە چی دروستکراوە، ئینجا اللَّهُ باسی ئەو مادەیە دەکات کە مرۆڤی لێدروست بوەو دەفەرموێ:

﴿٦﴾ دروستکراوە لە ئاوێك کە زۆر بەپەلە دەردەپەڕێت.

﴿٧﴾ کە لە پشتی پیاوو ئێسکە وردەکانی سینگی ئافرەتەوە دەر دچێت، جا لە بەیەك گەیشتنی ئەم دووانە نەوەی ئادەم دروست دەبێت‌و قۆناغی یەکەمی دروستبونی مرۆڤ دەست پێدەکات، ئاشکرایە ئەو زاتەی کە ئەم مرۆڤە ڕێك‌وپێکەی لەو ئاوە نەرم‌و شل‌و بێ گیانە دروستکردوە زیندوکردنەوەی پاش مەرگی لەلا ئاسانترە، ئەگەرچی هیچ شتێك لای خوا دژوارو سەخت نیە،

(٨) بێگومان کە ﷲ بۆ گەڕانەوەو دروستکردنەوەو زیندوکردنەوەی ئەو مرۆڤە لەپاش مەرگی بەتوانایەو هەر کاتێك ئارەزۆ بکات زیندوی دەکاتەوە بەتایبەت بۆ کۆکردنەوەو بگرەو بەردەی دواڕۆژ، ئەگەرچی مانای تر کراوە بەڵام من ئەم مانایەم بەلاوە نزیکترە لەبەرئەوەی کە دەفەرموێ:

(٩) ئەو گەڕانەوەی مرۆڤە لە ڕۆژێکدا دەبێت کە هەمو نهێنیەکان ئاشکرا دەبێتو کەس ناتوانێت هیچشتێکی خۆی حەشار بداتو خۆی بشارێتەوە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: {لِكُلِّ غَادِرٍ لِوَاءٌ يَوْمَ الْقِيَامَةِ يُرْفَعُ لَهُ بِقَدْرِ غَدْرِهِ أَلَا وَلَا غَادِرَ أَعْظَمُ غَدْرًا مِنْ أَمِيرِ عَامَّةٍ /متفق عليه/ بۆ هەمو مرۆڤێکی ناپاکی غەدرکەر لەرۆژی قیامەتدا ئالآیەك هەیە بەئەندازەی ناپاکییەکەی، ئاگاداربن هیچ ناپاکیو غەدرێك گەورەتر نیە غەدرەکەی لەغەدری ئەمیری گشتی}

(١٠) جا ئەوکاتە ئەوەندە بێدەسەڵاتە بۆ ئەو هیچ هێزێك نیە، بەڵکو زۆر لاوازو دەستەپاچەیەو کەسیش یارمەتی نادات، هەروەك لە سورەتی ئینفیتاردا فەرموی: (لەو ڕۆژەدا کەس خاوەنی هیچ شتێك نیە بۆ کەسێکی ترو فەرمان لەو ڕۆژەدا هەر بۆ ﷲیە) جارێکی تر ﷲ سوێند بە ئاسمانو زەوی دەخواتو دەفەرموێ:

(١١) سوێند بە ئاسمانی خاوەن گەڕاندنەوە جا چی ڕووناکی مانگو ڕۆژو ئەستێرەکان بگەڕێنێتەوە بۆ سەر زەوی تا سودیان لێ وەربگیرێت یان گەڕاندنەوەی یەك لەدوای یەکی فریشتەکان بۆ پارێزگاریو نوسینی کاروباری مرۆڤ یان گەڕاندنەوەی هۆی ڕۆژی مرۆڤ یان گەڕاندنەوەی گیانی خوانەناسان بۆ لاخواروی زەوی وتۆمارکردنی لەناوسجین دابێت کە بەفەرمانی ﷲ هەمویان دەکات، دوورنیە بە مانای ئەو ڕۆژە بێت کە فەرمانی لەناوچونی دنیا دەدرێت کە لە ئاسمانەوە دەست پێدەکاتو بە شەق بونی زەویو دەرهێنانی مردووەکان کۆتایی پێدێت.

(١٢) جا سوێند بە زەویەش کە خاوەنی شەقارودرزوکەلێنە جا چ بەمانای پێشو بێت یان شەقبونی زەوی بۆ وەرگرتنی ئاوی ئاسمانو عەمارکردنی بۆ مرۆڤ و شەقبونی زەوی بۆ سەورزکردنی گژوگیاوو درەخت بۆ مرۆڤ و مەڕو مالآتەکانیان وەك لە سورەتی عەبەسەدا باسکرا، کە هەمویان ڕاستەو هەمویشیانی تێدا ڕودەدات، جا خوا سوێند دەخوات بە ئاسمانی خاوەنی گەڕانەوەو زەوی خاوەن شەقبونو دەفەرموێ: سوێند بەوانە

(١٣) بەبێگومان ئەو (قورئانە)و ئەو باسەی کەکرا قسەیەکە ڕاستو ناڕاست لەیەك جیادەکاتەوە.

(١٤) خۆ ئەوە شتێکی گاڵتە نیە. بەڵکو شتێکی ڕاستەو لەلایەن زاتێکی ڕاستەوە هاتووەو بۆ مەبەستێکی ڕاستەو هاتوتە لای مرۆڤێکی ڕاستو دەستو دەم پاك بەهۆی فریشتەیەکی ڕاستو ئەمینەوە، تا ئێرە سێ مەبەستی سەرەکی بیروباوەڕی باسکرد یەکەمیان: بونو پەروەردگاریەتی ﷲ خۆی، دووهەمیان: زیندوبوونەوەو دواڕۆژو سێهەمیشیان،ڕاستیو دروستی قورئان، ئینجا خوا پەردە لەسەر نهێنیو ئیشە ناپەسندەکانی بێباوەڕان لادەداتو دەفەرموێ:

(١٥) بەڕاستی ئەوان هەمیشە هەر خەریکی فڕوفێڵکردنو پیلانگێڕانن دژی خاوەن باوەڕان، جا ئایا ئەوە دەبێت کەخوا دۆستانی خۆی بدات بەدەست ئەو تاوانبارانەوە؟ نەخێر، بەڵکو دەفەرموێ:

(١٦) منیش چارەی فڕوفێڵی ئەوان دەکەمو بەشێوەی بەرنامەی خۆیان دژی باوەڕداران تۆڵەیان لێوەردەگرمەوە، واتە: ئەوان بەشێوەیەکی نهێنی دەیانەوێت زیان بگەیەنن بە خاوەن باوەڕانو ئازاریان بدەن منیش بەو شێوەی کە ئەوان بەخۆیان نازانن تا دەیانخەمە داوەوەو تۆڵەیان لێوەردەگرم، جا ئەمە یەکێکە لە وەسفە کرداریەکانی ﷲ (الصفة الفعلية)و باوەڕمان پێی هەیەو بێ ئاگایین لە چۆنیەتیەکەی. ئینجا ڕوو لە پێغەمبەرمان ﷺ دەکاتو دەفەرموێ:

(١٧) دەی سا تۆ ماوەی بێباوەڕان بدە باچی دەتوانن بیکەن، کەمێك ماوەیان پێبدە، جا تەماشا بکە خوا وا پیشان دەدات کە لەناوبردنو فەوتانی بێباوەڕان بە دەست پێغەمبەرەو دەفەرموێ: تۆ ماوەیان پێبدە، لەڕاستیدا ئەمە دڵخۆش کردنێکی زۆر گەورەیە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ چونکە ماوەدانو ماوەنەدان تەنها بەدەست ﷲ خۆیەتی، جا ئەم بڕیاری ماوەپێدانە لەگەڵ ئایەتی پێنجی سورەتی تەوبەدا کە دەفەرموێ:﴿ جا بت پەرستانتان لەهەرکوێدا دەستکەوت بیانکوژن﴾ دژایەتی هەیە وەڵامەکەی بەم شێوەیە کە ئەم ئایەتە حوکمەکەی بە ئایەتی پێنجو باقی ئایەتەکانی شمشێر هەڵوەشاوەتەوەو هەر لەم ئایەتەدا چاوەڕێکردنی گۆڕان دەکرێت، چونکە دەفەرموێ: ﴿أَمْهِلْهُمْ رُوَيْدًا﴾ کەمێك ماوەیان پێبدە، واتە لەپاش ئەو ماوە کەمە ئەو بڕیارە دەگۆڕێت. بەڵێ ئەوانە فڕوفێڵیان دەکرد تا موسڵمانان لە ئاینە بە نرخەکەی ئیسلام

لابدەن، بەڵام خوا بەو کۆمەڵە لاوازو کەمە تۆڵەی لەو بێباوەڕانە سەندو موسڵمانانو ئاینەکەی سەرخست.

## ٨٧ سورەتی ئەعلا ١٩

سورەتی ئەعلا کە هەشتاو حەوتەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، نۆزدە ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین حەوتەمین سورەتەو پاش سورەتی (التكوير)و پێش (الليل) دابەزیوە. ئیمامی أحمد لە عەلیەوە (خوا لێی ڕازی بێت) هێناویەتی کە وتویەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سورەتەی خۆشویستوە، وە لە بوخاریو مسلم دا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ بە مەعازی فەرمو:{هلا صلَّيتَ بِ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ و﴿وَٱلشَّمْسِ وَضُحَىٰهَا﴾ و﴿وَٱلَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ﴾/ دەبوایە نوێژت بۆبکردنایە بە خوێندنی ئەو سورەتانە}

هەروەها لەلای مسلمو لە سونەندا هاتوە کە:{ پێغەمبەر ﷺ لە نویژی جەژنەکانو جومعەدا سورەتی (ئەعلا) و (غاشیە)ی خوێندوە، جا ئەگەر وا ڕێك بکەوتایە جەژنو جومعە لە یەك ڕۆژدابوایە لە هەردووکیان دەیخوێندنەوە}، وە لە عائیشەو لە چەند ڕێگایەکی ترەوە ئیمامی أحمد هێناویەتی کە:{ پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی تاك (الوتر)دا سورەتی (الأعلَى)و ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾و ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ﴾ وە عائیشە زیاد دەکاتو دەڵێت: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ی خوێندوە. سورەتەکە بەم شێوەیە دەست پێدەکاتو دەفەرموێ:

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆز بێنیهایەت میهرەبان

(١) ناوی پەروەردگاری بڵند مەقامت پاكوخاوێن ڕابگرەو یادی بکەو ڕێز بۆ ناوە پیرۆزەکانی دابنێو ئەو ناوەی کەلەخۆیەوە بۆت هاتوە ڕابگەیەنەو خەڵکی لە ناشیرینکردنو بێ ماناکردنی بترسێنە، واتە: هەروەك زاتەکەی پاكو بێوێنەیە، هەروەها ناوە پیرۆزەکانیشی پاكو بێوێنەن، وە لە فەرمودەی پێغەمبەرمان ﷺ دا هاتوە کە (تەسبیحات) واتە یادکردنی خوا جا کاتێك کەئەم سورەتە دابەزی فەرموی: ﴿سَبِّحِ ٱسْمَ رَبِّكَ ٱلْأَعْلَى﴾ پێغەمبەر ﷺ فەرموی :{سُبحَانَ رَبِّيَ الأعلَى/ابوداود،صححه الألباني/، وشەی (سُبحَان) واتە پاكو بێعەیب.

جا لەپاشدا چەند شتێك باسدەکات کە بەڵگەی دەسەڵاتو زانایيو کاربەجێی خوایەو ڕۆشنکەرەوەی مانای (سُبحَان)ەیەو دەفەرموێ:

(٢) ئەو پەروەردگارەی تۆ ئەو زاتەیە کە هەموشتێکی دروستکردوە، ئینجا ڕێكوپێکی کردوە. واتە خوا ئەو زاتەیە کە ئەو هەمو دروستکراوانەی لە نەبونەوە هێناوەتە کایەوەو هەمو شتێکیشی ڕاستو دروستو بەگوێرەی پێویست دروستکردوە، هەر لە دروستکردنی عەرشو کورسیو ئاسمانانەوە بگرە تا مرۆڤ و مەڕوماڵاتو میکرۆب هەموی دروستکراوی ئەوەو هەر کامیان چی پێویست بێت بۆی دروستکردوە، واتە بێعەیبە لە دروستکردنو ڕێكوپێك کردنیاندا، وە دەفەرموێ:

(٣) جا ئەو پەروەردگارەی تۆ ئەو زاتەیە کە ئەندازەگیری هەموشتێکی کردوەو ئینجا ڕێنمایی کردوە کە چی بکاتو چۆن بژیتو چۆن خۆی بپارێزێت. ئاشکرایە ئەندازەگیری اللَّهُ لە هەمو دروستکراوەکانیدا بیکۆڵیتەوەو وردو سەرسوڕهێنەرە تا زانایان زیاتر لێی بکۆڵنەوە شتی زیاترو گرنگترو سەرسوڕهێنەرتری تێدا دەبینن، بۆ نمونە دوری ڕۆژ لە زەوی کە ئەگەر کەمێك دوورتربوایە هەمو زەوی دەیبەستو دەبو بە سەهۆڵبەندانو کەس لەسەری نەدەژیا وە ئەگەر کەمێك نزیکتر بوایە هەمو دارو درەختو گژوگیا دەسوتاو دیسان زیندەگی تێدا نەدەکرا، جا هەر بەو جۆرە چۆنیەتی هەواو جۆریو پێویستی مرۆڤ بەو هەوایەو چۆنیەتی دابینکردنو پاكو خاوێنکردنەوەی بەهۆی دارودرەختو گیاو شینایيەوە، خۆ ئەگەر تەماشای هەر کوێ بکەیت یەك لە یەکی گرنگترو سەرسوڕهێنەرترن، بۆ نمونە: هەر سەرئەنگوشتان بەسە بۆ زانینی توانایيو زانایيو دانایی اللَّهُ کە سەر ئەنگوشتی هیچ کەس لەوی تر ناکاتو ئێستا هەمو خەڵك بەوە دەزانێت، چونکە کراوە بەهۆی پێناسەی مرۆڤ و جیاکردنەوەی لەیەك لە هەمو جیهانداو ماوەی دوو سەد ساڵێکە زانراوە، واتە دەرکەوت ئەو زاتە لە دروستکردنەکانی خۆیدا هەروەکو ڕێك و پێکە هەر وەهایش سنوردارەو هەریەکەی سنورێکی تایبەتی خۆی هەیەو ڕێنمایشی کردوە چۆن بکات، هەر بۆ نمونە باڵندەیەك دەبێت بزانێت کەی کاتی هێلکە کردنیەتیو پێش ئەوە دەبێت جێگای هێلکەکردنەکەی خۆی چاك بکاتو کاتێك کە بەچکەو خواردنیان بۆ دێنێت دەبێت بزانێت بە کامیانی داوەو کامیان هیچی پێنەدراوە، دڵ دەبێت بزانێت چۆن ئیش بکات بۆ دابەشکردنی خوێنو هەزاران شتی تر لەم بارەوە کە لە توانای مرۆڤدا نیە ژمارەکردنیان نەك باسکردنیان کەواتە (سُبحَانَ الذي خَلَقَ فَسَوَّى وَالذي قَدَّرَ فَهَدَى) ئینجا دەفەرموێ:

(٤) ئەو پەروەردگارەی تۆ ئەو زاتەیە کە گیاو لەوەڕی دەرهێناوە بۆ مرۆڤو بۆهەمو گیاندارانو زەوی پێ ڕەنگین

کردووە هەوای پێ پاك کردووەتەوەو کەم کەم ئەو گژوگیایە پێدەگەن‌و زەرد دەبن‌و وشك دەبێتەوەو زەوی جارێکی تر ڕەش دەبێتەوە وەکو دەفەرموێ:

(٥) ئینجاالله ئەو لەوەڕەی کە سەوزی کردبو، ئەوسا وشکی کردو هەڵیوەراندو بەرگی سەوزی زەویشی لابردو ڕەشی کردەوە، لێرەدا بەکورتی دروست بون‌و ژیان‌و نەمانی هێنایە بەرچاومان‌و پێمان دەفەرموێ: ئەوەی کە بە چاوی خۆتان لە یەك ساڵدا دەیبینن وانیەکەو بە ئێوەی دەڵێم کە ئێوەش هەروەها دەبن، لەدایك دەبن‌و کەم کەم دەبن بە مرۆڤی تەواو دیسان کەم کەم دادەبەزن‌و لەناکاو گیانتان لێوەردەگیرێت‌و دەبن بە ئێسك‌و پروسکێکی هەڕاو بەیەکدا کوتاوو ڕەش دەبنەوە، ئینجا الله مژدەیەکی خۆش بە پێغەمبەرمان ﷺ دەدات‌و دەفەرموێ:

(٦) بەم زوانە ئێمە ئەم قورئانە دەخوێنینەوە بۆت‌و ئیتر تۆ لەبیرت ناچێت.

(٧) مەگەر الله خۆی ئارەزۆی لەبیربردنەوەی بکات، بەڵێ ئەمە مژدەیەکی زۆر دڵخۆشکەر بو بۆ پێغەمبەر ﷺ چونکە زۆر دەترسا لەبیری بچێتەوەو تەنانەت جاری وا هەبو نەدەوەستا تا جبرەئیل لە خوێندنەوەی ببێتەوە ئەو پەلەی دەکرد بۆ خوێندنەوەی تا الله فەرموی:﴿ هیچ تەکانێك بە زمانت مەدە بۆ ئەوەی پەلەبکەیت بە خوێندنی ئەم قورئانە (مەترسە لە لەبیرچونەوەی) چونکە بەڕاستی ئێمە ئەو قورئانە کۆدەکەینەوەو بۆت دەخوێنینەوە، جا هەر کاتێك ئێمە خوێندمانەوە بۆت لەڕێگای جبرەئیلەوە ئەوسا تۆیش بەدوای خوێندنەوەی ئەودا بڕۆ/ قیامە: وە فەرموی:﴿ بێگومان ئیمە ئەم قورئانەمان ڕەوانە کردووە بێشك کە دەیپارێزین ﴾حیجر. بەم شێوەیە خوای میهرەبان پێغەمبەرمانی ﷺ دڵنیاکرد کە ئەم قورئانەی لەبیرناچێتەوە، مەگەر الله خۆی ئارەزۆی لەبیربردنەوەی شتێك لەو قورئانە بکات ئەوەش بە نەسخ دەناسرێت لەلای زانایان، جا زیاتر دڵخۆشی دەکات‌و دەفەرموێ: بەڕاستی ئەو دەزانێت بەو شتانەی کە بە ئاشکرا دەیکەن و ئەوەیش کە دەیشارنەوە، واتە هیچی لێ ناشارێتەوەو ئاشکراو نهێنی لای ئەو یەکسانە، جا تۆیش زیاتر سوربە لەسەر بڵاوکردنەوەی پەیامەکەت‌و لە فێڵ‌وفڕی دژمنانت مەترسە، چونکە پەروەردگارت چاودێرتەو هەڵسوکەوتی دوژمنانتی لەبەر چاوە.

(٨) ئێمە تۆ ئامادە دەکەین بەشێوەیەك کە ئەنجامدانی ئیشی چاکەو قسەی خێرت لەلا ئاسان بێت‌و بەرنامەیەکت پێدەسپێرین کە ئاسان‌و چاك‌و ڕێك‌وپێك بێت.

(٩) دەی سا تۆش بەردەوامبە لەسەر ئامۆژگاری چ سودی ببێت ئامۆژگاریەکەت‌و چ نەیبێت، چونکە بەرنامەی تۆ گەیاندنی پەیامی ئێمەیە بە خەڵك‌و نەهێشتنی بەهانەی خەڵکە، جا ئەگەر پەیامەکەی لێوەرگرتیت ئەویش خۆشبەخت دەبێت، خۆ ئەگەر وەریشی نەگرت تۆ ئەرکی سەرشانی خۆتت ئەنجامداوەو کابرایش بەهانەی نەماوە بۆ دواڕۆژ، وە دەشگونجێت بەم مانایە بێت کە تۆ ئامۆژگاری بکە هەتا ئەو کاتەی کە دەزانیت ئامۆژگاریکردنیان بەسودە و هەر کاتێك زانیت سودی نیە ئیتر ئامۆژگاریکردنیان پێویست نیە لەسەرت واتە: زانیاری خۆت لەبەردەم کەسێکدا دابنێ کە نرخی بزانێت، چونکە هەر ئەو کەسەیە سود لە تۆ وەردەگرێت وەك دەفەرموێ:

(١٠) بەم زوانە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرێت لە قسەو ئامۆژگاری تۆ ئەو کەسەی دەترسێت لە ئایندەو پاشەڕۆژی خۆی‌و دادگای اللهداناو دەسەڵاتدار.

(١١) جا دوردەکەوێتەوە لە ئایەتەکانی خواو ئامۆژگاریەکانی تۆ بەدبەختترین‌و خراپترین کەس، ئاشکرایە هاتنی مرۆڤ بۆ دنیا بۆ دەرکەوتنی پیاو چاك و پیاو خراپە، وە دواڕۆژ لەسەر ئەو دەرکەوتنەیە بەسەر بەهەشت یان دۆزەخدا دابەشدەکرێن.

(١٢) ئەو خراپترین کەسە دەچێتە ناو ئاگری گەورەترەوە.

(١٣) پاشان نامرێت تا لەو سزایە ڕزگاری ببێت‌و ناژی بە ژیانێکی وا کە سودی هەبێت بۆی بەڵکو ژیانەکەی زیانە بۆی وەك لە سورەتی ئیبراهیم دا دەفەرموێ: ﴿لەهەمو جێگایەکەوە مردن بۆی دێت بەڵام نامرێت﴾ وە هەمان مەبەست لە ئایەتی حەفتاوچواری سورەتی (تاها) دا هاتوە. پاشان دەفەرموێ

(١٤) بەڕاستی ڕزگاربوە ئەو کەسەی کە خۆی لە خراپەو تاوان پاك دەکاتەوە بە پەشیمان بوونەوە لێیان‌و ئەنجامدانی ئیشی چاك.

(١٥) وە ئەو کەسەیش کە یادی ناوی پەروەردگاری خۆی کرد بێ، جا پێنج نوێژە فەرزەکانی ئەنجام دابێت، هەندێك لێرەدا (تزکی)یان بە زەکاتی سەرچاك کردنەوەی (زكاة الفطر) داناوەو (فَصَلَّىٰ) بەمانای نوێژی جەژن داناوە، بەڵام بە مانای پێشوو

بَلۡ تُؤۡثِرُونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا ﴿١٦﴾ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰٓ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾

## ٨٨ سُورَةُ الغَاشِيَةِ ٣٦

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ ﴿١﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٍ خَٰشِعَةٌ ﴿٢﴾ عَامِلَةٞ نَّاصِبَةٞ ﴿٣﴾ تَصۡلَىٰ نَارًا حَامِيَةٗ ﴿٤﴾ تُسۡقَىٰ مِنۡ عَيۡنٍ ءَانِيَةٖ ﴿٥﴾ لَّيۡسَ لَهُمۡ طَعَامٌ إِلَّا مِن ضَرِيعٖ ﴿٦﴾ لَّا يُسۡمِنُ وَلَا يُغۡنِي مِن جُوعٖ ﴿٧﴾ وُجُوهٞ يَوۡمَئِذٖ نَّاعِمَةٞ ﴿٨﴾ لِّسَعۡيِهَا رَاضِيَةٞ ﴿٩﴾ فِي جَنَّةٍ عَالِيَةٖ ﴿١٠﴾ لَّا تَسۡمَعُ فِيهَا لَٰغِيَةٗ ﴿١١﴾ فِيهَا عَيۡنٞ جَارِيَةٞ ﴿١٢﴾ فِيهَا سُرُرٞ مَّرۡفُوعَةٞ ﴿١٣﴾ وَأَكۡوَابٞ مَّوۡضُوعَةٞ ﴿١٤﴾ وَنَمَارِقُ مَصۡفُوفَةٞ ﴿١٥﴾ وَزَرَابِيُّ مَبۡثُوثَةٌ ﴿١٦﴾ أَفَلَا يَنظُرُونَ إِلَى ٱلۡإِبِلِ كَيۡفَ خُلِقَتۡ ﴿١٧﴾ وَإِلَى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ رُفِعَتۡ ﴿١٨﴾ وَإِلَى ٱلۡجِبَالِ كَيۡفَ نُصِبَتۡ ﴿١٩﴾ وَإِلَى ٱلۡأَرۡضِ كَيۡفَ سُطِحَتۡ ﴿٢٠﴾ فَذَكِّرۡ إِنَّمَآ أَنتَ مُذَكِّرٞ ﴿٢١﴾ لَّسۡتَ عَلَيۡهِم بِمُصَيۡطِرٍ ﴿٢٢﴾ إِلَّا مَن تَوَلَّىٰ وَكَفَرَ ﴿٢٣﴾ فَيُعَذِّبُهُ ٱللَّهُ ٱلۡعَذَابَ ٱلۡأَكۡبَرَ ﴿٢٤﴾ إِنَّ إِلَيۡنَآ إِيَابَهُمۡ ﴿٢٥﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا حِسَابَهُم ﴿٢٦﴾

گشتی ترەو هەمویان دەگرێتەوە، ئینجا ﷲ ڕوی فەرمودەی دەکاتە بێباوەڕانو دەفەرموێ:

(١٦) بەڵكو ئێوە ژیانی دنیاو ڕابواردنە کورتەکەی دنیا بۆ خۆتان هەڵدەبژێرنو بە ئەوەوە خۆتان خەریك دەکەن.

(١٧) سا دڵنیابن کە هەر پاشەڕۆژ چاکترەو هەر ئەوە دوانەهاتو.

(١٨) خۆ ئەم بڕیارە لە پەڕەکانی پێشویشدا کەبۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ هاتوون تۆمارکراوە .

(١٩) کە پەڕەکانی ئیبراهیمو موسا یە(سەلامی خوایان لێبێ) واتە ئەوەی کە لەم سورەتەدا هاتوە لە پەڕەکانی ئەو دوو پێغەمبەرەشدا باسکراوە، وتراوە سەدو چوار پەڕە هاتوە دە بۆ ئادەمو پەنجا بۆ شیسو سی بۆ ئیدریسو دە بۆ ئیبراهیمو تەوراتو ئینجیلو زەبورو قورئاننیش.

## ٨٨ سورەتی غاشیە ٣٦

سورەتی غاشیە کە هەشتاو هەشتەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، بیستو شەش ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین نۆهەمین سورەتەو پاش سورەتی (الذاريات)و پێش (الكهف) دابەزیوە، لە پێشەوە وتمان کە پێغەمبەر ﷺ سورەتی ئەعلاو ئەم سورەتەی لە نوێژی جەژنو جومعەدا دەخوێند، پرسیار کرا لە نوعمانی کوڕی بەشیر کە پێغەمبەر ﷺ لە نوێژی جومعەدا لەگەڵ سورەتی (الجمعه)دا چیتری دەخوێند وتی {﴿هَلۡ أَتَىٰكَ حَدِيثُ ٱلۡغَٰشِيَةِ﴾ی دەخوێند} . ئیمامی مالیكو ئیمامی موسلمو بێجگە لەوانیش ئەم فەرمودەیان هێناوە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئایا پێتگەیشتوە قسەو باسی ئەوداپۆشەرە واتە: ئایا دەنگوباسی پاشەڕۆژت پێگەیشتوە کە داپۆشەری هەمو خەڵکەو هەمو کەسێك دەگرێتەوەو کەس ناتوانێت ئەو ڕۆژە نەبینێت؟ وشەی (الغاشيه) ناوێکە لە ناوەکانی پاشەڕۆژ، ئینجا هەندێك لە ڕووداوە گرنگەکانی ئەو ڕۆژە سامناکە باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٢) کۆمەڵە خەڵکێك هەن کەلەو ڕۆژەدا شەرمەندەو چاوشۆڕن.

(٣) ئیشکەرەو ماندووە، چونکە ئیشەکانیان ڕاستو دروست نەبووە، ئێستا تەنها ماندوبونیان بۆ ماوەتەوەو دەستیان خاڵیو نائومێدو شەرمەندن لەو ڕۆژەدا.

(٤) ئەوکەسە دەچێتە ناو ئاگری زۆر گەرمەوە،

(٥) کە لە سەرچاوگەیەکی زۆر داخیش ئاوی پێدەدرێت.

ئەگەرچی وشەی (خَٰشِعَةٌ، عَامِلَةٞ، نَّاصِبَةٞ، تَصۡلَىٰ) بە تاك هاتون، بەڵام چونکە مەبەستی بەو ئەو خاوەن دەمو چاوە شەرمەندەو سەرشۆڕانەیە بۆیە بە کۆ ئەمجارە دەفەرموێ:

(٦) بۆ ئەوان هیچ خواردنێك نیە بێجگە لەو دڕکی حوشتر خوار. کەدرەختێکی دڕکاوییە جگە لەحوشتر هیچەتر نایخوات.

(٧) نە کەس قەڵەو دەکاتو نە کەس لە برسێتی ڕزگار دەکات واتە: ئەویش تەنها سزایەکەو لە برسا پەلاماری دەداتیو بە هەزار حاڵ تا لە گەروی ئاوادەبێت، بەڕاستی زۆربەی ئێمە ئاوەهاینو هەمیشە ماندوین چ ئەوانەمان کە هەمیشە خەریکی ماڵ کۆکردنەوەو عەمارکردنینو خواو پاشەڕۆژیان لەبیر نەماوە، چ ئەوانەمان کە خۆی بەناو دینەوە ماندو دەکات بەڵام لە ڕێگای بیدعەتو خەرافاتەوە، جێگای ئەوەیە کە ئەم جۆرە کەسانە باش لەم ئایەتانە وردببنەوەو خۆیان دوچاری ئەم ڕۆژە سامناکەو ئەو شەرمەندەییو ڕۆژ ڕەشیە نەکەن، ئینجا هەروەکو باوی قورئان پاش باسکردنی خراپانو سزایان باسی چاکەکارانو پاداشتیان دەکاتو دەفەرموێ:

(٨) چەند ڕوویەکیش هەن لەو ڕۆژەدا کە شادمانو کەیفخۆشە.

(٩) چونکە ڕازیە لەو کۆششەی کە لە دنیادا کردویەتی، جا ئەو ڕۆژە کە ئەو کۆمەڵە خراپە دەخرێنە ناو ئاگری سوتێنەرو ئاوی داخەوە، ئەوان خۆشترین خواردنیان پێدەدرێتو بە بەرهەمی کرداری خۆیان لەو ڕۆژەدا شادمانن.

(١٠) لەناو بەهەشتی بڵند مەقامدان.

(١١) لەناو ئەو بەهەشتەدا هیچ قسەیەکی بێسوودو بێنرخ نابیستێت، بەڵکو هەر سەلام کردنو شاد باش بەیەکتر وتنە، ئینجا خوا بەکورتی باسێکی ئەو بەهەشتە دەکاتو دەفەرموێ:

(١٢) تێیدایە چاوگەی ئاوی گەورە کەهەمیشە فرکەی دێت.

(١٣) جا لەناویدا تەختگەلی بەرزکراوە هەن،

(١٤) وە گۆزەو پەرداخ گەلی تێدا دانراوە،

(١٥) جا پاڵشتی گەلێکی فرەوانی تێدا ڕیزکراوە.

(١٦) خۆ فەرش ڕێژیش کراوە، ئەمانەو سەدان بەڵکو هەزاران نیعمەتی تر لەو بەهەشتەدا ئامادەکراوە بۆ پیاوچاکان،وەك لە حەدیسی قودسیدا هاتوە کە خوا دەفەرموێ: {أعددتُ لِعِبَادي الصَالحين مالا عينٌ رأت وَلا أُذنٌ سَمِعَت وَلا خطَرَ عَلَى قَلبِ بَشَرٍ/ البخاری وغيره/ واتە: ئامادەم کردوە بۆ بەندە چاکەکانم ئەوەی کە چاو نەیبینیوەو گوێ نەیبیستوەو نەهاتوە بە دڵی هیچ مرۆڤێکدا} بەڕاستی مرۆڤی داناو ژیر ئەو کەسەیە کە کێبەڕکێ بکات بۆ بەدەستهێنانی ئەم جێگا بەنرخو پڕ نازو نیعمەتەو لە هەموی خۆشتر پاش بینینی خوا ئەوەیە کە هیچ ئێشو ئازارێکی تێدانیەو هەرگیز دوایی نایەت، خوا بیکات بە نسیب گشت لامان. آمين. ئینجا پاش ئەوەی سەردانێکی بەهەشتو دۆزەخی پێکردین دەمانهێنێتەوە بۆدنیاو چەند دروستکراوێکی گرنگی خۆی دەخاتە پێش چاومان تا چاکتر ئەو زاتە بناسینو باشتر هەوڵی خواناسیو چاکە بدەینو دەفەرموێ:

(١٧) ئایا تەماشای حوشتر ناکەن کە چۆن دروستبوە؟ بەڕاستی دروستکراوێکی سەرسوڕهێنەرە هەم لە بارەی چۆنیەتی دروستبونیەوەو هەم لەبارەی هێزو توانای هەڵگرتنی شتی زۆر قورسو گەردنکەچو ڕامی بۆ بێ هێزترین مرۆڤ و گۆشتی دەخورێتو باری پێ هەڵدەگیرێتو سود لە کورکو شیرەکەی وەردەگیرێت، لە ڕاستیدا بەنرخترین ماڵی عەرەب بوە، بەتایبەت لەو کاتەدا کە سەیارە نەبوەو ناوچەکانیشیان کەم ئاو بوە کە حوشتر دەتوانێت جارێك ئاو بخواتو بەشی چەند ڕۆژێکی پێویست هەڵگرێ، بەهۆی ئەو کیسە تایبەتەی کە خوا پێیداوە.

(١٨) جا ئایا تەماشای ئاسمان ناکەن کە چۆن بەرزکراوەتەوە بێ ئەوەی کۆڵەکەیەکی هەبێت کە ئێمە بە چاو بیبینینو جوانو نەخشین کراوە بە ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانو هیچ شەقارێکی تێدانیە؟

(١٩) سا ئایا تەماشای چیاکان ناکەن کە چۆن دروستکراون؟ کە بوتە هۆی جوانکردنی زەویوراگیر کردنیو بە هێزکردنیو عەماری ئاوی زەوی.

(٢٠) جا ئایا تەماشای زەویش ناکەن کە چۆن پان کراوەتەوەو هەمو شتێکی پێویستی زیندەگی تێدا دانراوە؟ واتە بۆ بیر لەوانە ناکەنەوەو خوای خۆتان بناسنو گوێڕایەڵو فەرمانبەرداربین، خۆ چاك دەزانن ئەم چوار دروستکراوە کە هەمیشە وەبەر چاوتان دەکەوێتو کراوە بە ماڵێكو ئێوەی تێدا دەژی هیچی دروستکراوی دەستی مرۆڤ نیە، بەڵکو مرۆڤ لە ڕاست ئەو چوار دروستکراوە گرنگەدا سەرسامەو بیر لە کامیان بکاتەوە دەیانو سەدان شتی گرنگیان تێدا بەدی دەکاتو هەریەکەی بانگەوازی تاكو تەنیاییو زانایيو دەسەڵاتو دانایی ﷲ دەکات، خۆ هەر خۆیان بەسن ئەگەر مرۆڤ ژیری خۆی بخاتەکارەوە بۆ سەلماندنی تاكو تەنیاییو دەسەڵاتی خواو تەنها وەبیرهێنانەوەی دەوێت، بۆیە پاش ئەوانە دەفەرموێ:

(٢١) ئەی محمد تۆ ئامۆژگاری بکەو وەبیریان بخەرەوە بێگومان تۆ بێجگەلە ئامۆژگاریکارێك شتێکی ترت پێنەسپێرراوە.

(٢٢) تۆ زۆرت نیە بەسەر ئەواندا و زاڵ نیت کە ئەوان بەزۆر بخەیتە سەر ڕێگای ئایین، واتە تۆ دڵت نارەحەت نەبێتو خەمیان مەخۆ، چونکە ئەرکی سەرشانی تۆ تەنها ئامۆژگاریو ڕاگەیاندنە ، جا ئەوە نەبێ کە ئەوان هەرچی بکەن لە چاكو خراپ هەروەکو یەك تەماشا بکرێن نەخێر وانیە.

(٢٣) بەڵام ئەو کەسەی کە پشتی کردبێتە ئایینو بێباوەڕ بووبێت،

(٢٤) ئەوسا خوا سزایان دەدات بە سزایەکی گەورەتر لەو تاوانانەی کە دەیانکردو لەو ئێشو ئازارانەی کە بۆ خاوەن باوەڕانیان دروست دەکرد لە دنیادا.

(٢٥) بەبێگومان تەنها هەر بۆ لای ئێمە دەگەڕێنەوە، هەرچی ببنو هەرچی بکەنو هەچەند بژین هەر دەبێت بێنەوە بەر دەستمان.

٨٩ سُورَةُ الفَجۡرِ ٣٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡفَجۡرِ (١) وَلَيَالٍ عَشۡرٖ (٢) وَٱلشَّفۡعِ وَٱلۡوَتۡرِ (٣) وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَسۡرِ
(٤) هَلۡ فِي ذَٰلِكَ قَسَمٞ لِّذِي حِجۡرٍ (٥) أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ
(٦) إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ (٧) ٱلَّتِي لَمۡ يُخۡلَقۡ مِثۡلُهَا فِي ٱلۡبِلَٰدِ (٨)
وَثَمُودَ ٱلَّذِينَ جَابُواْ ٱلصَّخۡرَ بِٱلۡوَادِ (٩) وَفِرۡعَوۡنَ ذِي ٱلۡأَوۡتَادِ (١٠)
ٱلَّذِينَ طَغَوۡاْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ (١١) فَأَكۡثَرُواْ فِيهَا ٱلۡفَسَادَ (١٢) فَصَبَّ
عَلَيۡهِمۡ رَبُّكَ سَوۡطَ عَذَابٍ (١٣) إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ (١٤) فَأَمَّا
ٱلۡإِنسَٰنُ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ رَبُّهُۥ فَأَكۡرَمَهُۥ وَنَعَّمَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَكۡرَمَنِ
(١٥) وَأَمَّآ إِذَا مَا ٱبۡتَلَىٰهُ فَقَدَرَ عَلَيۡهِ رِزۡقَهُۥ فَيَقُولُ رَبِّيٓ أَهَٰنَنِ (١٦)
كَلَّاۖ بَل لَّا تُكۡرِمُونَ ٱلۡيَتِيمَ (١٧) وَلَا تَحَٰٓضُّونَ عَلَىٰ طَعَامِ
ٱلۡمِسۡكِينِ (١٨) وَتَأۡكُلُونَ ٱلتُّرَاثَ أَكۡلٗا لَّمّٗا (١٩)
وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا (٢٠) كَلَّآ إِذَا دُكَّتِ ٱلۡأَرۡضُ دَكّٗا
دَكّٗا (٢١) وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا (٢٢) وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ
بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ (٢٣)

(٢٦) لەپاشان بەبێشك پێویستمان كردوه لەسەر خۆمان كە لێ پێچینەوەیان لەگەڵدا بكەین‌و سزای خراپەو تاوانیان لێوەرگرین و پاداشتی چاكەی چاكەكارانیش بدەینەوە.

## ٨٩ سورەتی فەجر ٣٠

سورەتی فەجر كە هەشتاو نۆهەمین سورەتی قورئانە، لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوە، سی ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین دەهەمین سورەتە، پاش سورەتی (الليل)و پێش (الضحى) دابەزیوە.

ئیمامی نەسائی بۆمان دەگێڕێتەوە لە جابیرەوە كە وتی : مەعاز ئیمامەتی كرد لە نوێژێكداو كابرایەكیش هات لەگەڵ ئەودا نوێژی دابەست‌و مەعاز درێژەی دا بە نوێژەكەی‌و كابرا چوە كەنارێكی مزگەوتەكەوە بە تەنیا نوێژی خۆی خوێند، ئەم هەواڵە بە مەعاز گەیشت‌و ئەویش وتی: ئەوە مونافقە، ئەم قسەیە باسكرا بۆ پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری لەو كابرایە كرد، ئەویش وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من هاتوم نوێژی لەگەڵدا بخوێنم، كەچی ئەو زۆر درێژەی دا بەو نوێژەو من توانام نەماو وازم هێناو هاتمە گۆشەیەكی مزگەوتەكەوەو نوێژم كردو هاتمەوە ئالفم دا بە وڵاغە ئاوكێشەكەم، جا پێغەمبەر ﷺ كاتێ كەئەم قسەیەی بیست بە توڕەییەوە فەرموی: {أفتّان يا معاذ؟ أين أنت من ﴿سَبِّحِ ٱسۡمَ رَبِّكَ ٱلۡأَعۡلَى﴾ و﴿وَٱلشَّمۡسِ وَضُحَىٰهَا﴾و ﴿وَٱلۡفَجۡرِ﴾و ﴿وَٱلَّيۡلِ إِذَا يَغۡشَىٰ﴾ / ئەی مەعاز تۆ ئێش‌و ئازارو بەڵا دروست دەكەیت؟ ئەی تۆ بۆ سورەتی (الاعلى)و (الشمس)و (الفجر)و (الليل) ناخوێنیت؟} بەگوێرەی ڕیوایەتی تر ئەم نوێژە عیشا بوە واتە: سونەتە خوێندنی ئەو سورەتانەبۆ ئیمام لە نوێژی عیشادا.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە بەیانی، جا ئیتر دەگونجێت مەبەست هەمو بەیانیەك بێت، چونكە ئەو كاتە كاتێكی پڕ خێرو پیرۆزە بۆ باوەڕداران كە دوو ڕكات نوێژی سونەتی ئەو كاتە لە دنیاو ئەوەی لەناویدایە چاكترە بۆیان، وەكاتی گەڕانەوەی هێزە بۆ لەشی مرۆڤو ئامادەبونیەتی بۆ دەستپێكردنەوەی ئیش‌و كاروبارەكانی، دەشگونجێت مەبەست بەیانی ڕۆژی چەژنی قوربان یان بەیانی شەوی هاتنەخوارەوەی قورئان بێت یان مەبەست تەواوی ڕۆژ بێت.

(٢) جا سوێند بە دە شەوەكان، چ دە شەوی سەرەتای مانگی (ذی الحجة) بێت، یان دە شەوی كۆتای مانگی ڕەمەزان بێت كە شەوی قەدری تێدایە، یان مەبەست ئەوان‌و بێجگە لەوانیش بێت واتە: سوێند بە دە شەوی زۆر گەورە.

(٣) سا سوێند بە جووت وبە تاكیش كە دروستكراو هەموی جووتەو ﷲ خۆی تاكە، پێغەمبەر ﷺدەفەرموێ: { لِلَّهِ تِسْعَةٌ وَتِسْعُونَ اسْمًا مِائَةٌ إِلَّا وَاحِدًا لَا يَحْفَظُهَا أَحَدٌ إِلَّا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَهُوَ وَتْرٌ يُحِبُّ الْوَتْرَ/متفق عليه/ خوا نەودو نۆ ناوی هەیەو هەركەسێك لەبەریان بكات‌و كاریان پێبكات دەچێتە بەهەشتەوەو خۆی تاكەو تاكی خۆش دەوێ}

(٤) ئەوسا سوێند بە شەویش كاتێك كە دەڕوات، جا چ ڕۆیشتن‌و نەمانی بێت یان مەبەست شەوێكی دیاری بێت كە شەوی جەژنی قوربان‌و شەوی هاتنە خوارەوەی قورئان‌و شەوی شەوڕەوی‌و بەرزبونەوەی پێغەمبەرمان ﷺ بێت، كەلە هەمویاندا ڕوداوی گەورەو گرنگ ڕویداوەو شایانی ئەوەن كە ﷲ بەو سوێندەی بیانخاتەوە بیری مرۆڤ، تا مرۆڤ زیاتر بە بەندایەتی خوای خۆیەوە خەریك ببێت‌و زیاتر خۆی لە خواوە نزیك بكاتەوە، ئەگەر ژیرو بەفام بێت، بۆیە لەپاش ئەم پێنج سوێندە دەفەرموێ:

(٥) ئایا سوێند هەیە لەوسوێندانە گرنگتر تا سوێندی پێ بخورێت بۆ خاوەنی بیرو ژیر؟ واتە سوێندێكی گرنگتر لەمانە

نیە، لێرەدا سوێند لەسەرخوراوەکەی باس نەکردووە، چونکە ئەم باسەی پاش سوێندەکان سوێند لەسەر خوراوەکە ڕۆشن دەکاتەوەو دەتوانین بڵێین سوێند بەوانە بێباوەڕان، هەرچەند بەهێزبن وەکو: گەلی عادو هەرچەند ستەمکارو بێ بەزەیی بن وەکو فیرعەون‌و هەرچەند لەناوخۆیاندا بەش بەشبن‌و لە دژایەتی پێغەمبەرو ئایینەکەی‌و پەیڕەوانی یەکدەست بن وەکو: گەلی سەمود سەرئەنجام تێکدەشکێن‌و تۆڵەی تاوانەکانیان لێوەردەگیرێت، ئەوەتە لەپاش ئەو سوێندانە دەفەرموێ:

(٦) ئایا تۆ نەتزانیوە خوای تۆ چی کرد بە گەلی عاد؟ ئەو عادەی کە لە نەوەی

(٧) ئیرەمەو خاوەنی بەژن‌وباڵای بەرزو ستونی بەرزی ڕەشماڵەکانیان بون کەگەلێکی کۆچەری بوون، ئەم گەلە نەوەی عادی کوڕی ئیرەمی کوڕی عەوسی کوڕی سامی کوڕی نوح بون کە دژایەتی پێغەمبەرەکەی خۆیان کرد کە ناوی (هود ﵇)بو ﷲ ئەوو پەیڕەوانی ڕزگار کردو ئەو گەلەی بە بایەك کە حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بێبڕانەوە لێیدان‌و لەناوی بردن، لە چەند سورەتێکی تر بە درێژی باسیان کراوە، بەڵام لێرەدا تەنها باسی هێزو توانای ئەوان دەکات‌و دەفەرموێ:

(٨) ئەو عادەی کە وێنەی ئەوان تا ئەو کاتەی کە ئەم ئایەتە دابەزیوە نەبوە لە هیچ شارێکدا هەم لە هێزو دەسەڵاتیانداو هەم لە گەورەیی‌و بەهێزی لەشیاندا، ئینجا باسی گەلێکی تر دەکات‌و دەفەرموێ:

(٩) ئەی پێتگەیشتوە دەنگوباسی گەلی سەمود، ئەوانەی کە لە شیوەکاندا بەردی گەورەیان دەتاشی‌و شەقیان دەکردو دەیانکرد بە ماڵێکی گەورەو خۆش بۆ خۆیان ئەوانە لەجیاتی خانو دروستکردندا لەچیاکاندا ئەشکەوتیان دروست دەکردو دەیانکرد بە ماڵی خۆیان‌و پێغەمبەرەکەیان ناوی (صالح ﵇)بو ئەوانیش دژایەتی پێغەمبەرەکەیان کردو ﷲ بە دەنگێك لەناوی بردن، ئینجا باسی گەلێکی تر دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٠) جا ئایا دەنگوباسی فیرعەونت پێگەیشتوە، ئەو فیرعەونەی کە خاوەنی هێزێکی زۆر بو کە نەیارانی خۆی بە هەر چوارپەل لە هەر چوار لاوە دەبەستەوە بە مێخەوەو بەردی گەورەی لەسەر دادەنان تا دەمردن، ئینجا ﷲئەم سیانە دەداتە پاڵ یەك‌و دەفەرموێ:

(١١) ئەو کەسانە بون کە لەناو شارەکاندا دەستدرێژی‌و ستەمیان دەکرد.

(١٢) جا ئەمانە لەناوئەو شارانەدا خراپەیان یەکجار زۆر کرد لە داوێن پیسی‌و بێ ڕەحمی‌و دژایەتی پێغەمبەران‌و ئازاردانی خەڵك، ئەوەندە تاوانیان کرد خوا ڕقی لێیان هەستاو هەریەکە سزای تایبەتی خۆی بۆ ناردن. وەك دەفەرموێ:

(١٣) جا پەروەردگاری تۆ ڕژاندی بەسەر ئەواندا چەندین جۆر سزا لە دنیاداو بنبڕی کردن‌و هەر لەو کاتەشەوە چوونەتە ناو ئاگر تا ڕۆژی حیساب دێتە پێشەوەو دیسان دەخرێنە ناو سەختترین سزاوە. وەك لە سورەتی (غافر) (٤٥-٤٦)دا دەفەرموێ: ﴿هاتەدی بۆئالی فیرعەون خراپترین سزا کەئاگرە بەبەیانیان‌و بە ئێوارانداا رادەگیرێن لەسەری و کاتێ کە قیامەتیش هات فەرمان دەدرێت کە: ئالی فیرعەون بخەنە ناو سەخت ترین سزاوە﴾ ئینجا دەفەرموێ:

(١٤) بێگومان پەروەردگارت چاودێرەو کردارو وتارو ئاشکراو پەنهانی ئەوانە هەمودەبینێ‌ودەزانێ‌و لەپاشدا مافی هەموی دەدات چاك بەچاك‌و خراپیش بەخراپ، ئینجا خوای میهرەبان مرۆڤ لە بۆچونی نارەوا بەرگری دەکات‌و دەفەرموێ:

(١٥) کاتێك کە مرۆڤ تاقی بکرێتەوە لەلایەن پەروەردگاری خۆیەوەو ڕێزی لێ بگرێت‌و نیعمەتی خۆی بڕژێنێت بەسەریدا ئەو کاتە ئەو بەندەیە مانای تاقیکردنەوە نازانێت‌و وا دەزانێت ئەم ڕێزو نیعمەتە زۆرە لەسەرئەوە بوە کە ئەو مرۆڤێکی چاکەو دەڵێت: پەروەردگارم منی بەڕێز کردوە، کەچی هەر ئەو مرۆڤە ئەگەر دوچاری تەنگوچەڵەمە بکرێت زۆر بێزار دەبێت‌و ئاگای لە دروستبون‌و هاتنی خۆی بۆ ئەم ژیانە نامێنێت‌و نازانێ ژیان بەخۆشی‌و ناخۆشیەوە هەر تاقیکردنەوەیەو پاش کەمێکی تر دەبێ بنە وبارگەی خۆی بپێچێتەوەو بەرەو وەرگرتنی پاداشتی تاقیکردنەوەکەی خۆی بڕوات وەك دەفەرموێ:

(١٦) خۆ ئەم مرۆڤە هەر کاتێکیش تاقی بکرێتەوەو ژیانی لێ تەنگ بکرێتەوە دەڵێت: پەروەردگارم سووکی کردم، ﷲیش لە وەڵامی هەردوو لادا دەفەرموێ:

(١٧) نەخێر وانیەو ئەو گومانەی مرۆڤ ڕاست نیەو ﷲ ماڵ دەدات بە کەسێك خۆشی بوێت‌و بە کەسێکیش کەخۆشی نەوێت، وە ژیان تاڵ دەکات لە کەسێك کە خۆشی دەوێت‌و لە کەسێکیش کە خۆشی ناوێت لە هەردوولا کەسێك دەیباتەوە کە سوپاسی بکات‌و بە ئیشەکانی ﷲڕازی بێت. ئەوە بەجێگای خۆی کە ئێوە تەنها خۆشی‌و ناخۆشی خۆتان لەبەر چاوو دەگرن‌و بەشێوەیەکی هەڵە هەڵیاندەسەنگێنن، ئێوە ئەم ڕەوشتە خراپانەیشتان هەیە **یەکەم**: ئێوە ڕێزی هەتیو ناگرن، لە فەرمودەی پێغەمبەرمان ﷺ

دا هاتوه كه دهفهرموێ: { كَافِلُ الْيَتِيمِ لَهُ أَوْ لِغَيْرِهِ أَنَا وَهُوَ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ./احمد ومسلم/ سەرپەرستی كەری هەتیوو جگە لەویش منو ئەو لەبەهەشتدا ئاوەهاین بە دوو پەنجەی خۆی (پەنجەی شاهادەتو پەنجەی ناوەڕاست) هیمای كرد}

ئیسلام ئایینی میهرەبانیو خۆشەویستیەودەیەوێ مرۆڤ بەجوانی بژیو كۆمەڵگایەكی بەختەوەری هەبێت، لەبەرئەوەدژی هەموجۆرە ستەمێكە لەوانەماڵی هەتیو بەناڕەوا خواردنەو بەیەكێك لەو حەوت تاوانانەی داناوە كەمرۆڤ لەناودەبات، بەڵام ئەگەرئەوهەتیوە كابرای سەرپەرستی كەری كەمدەست بو ئەوەتاوان نیە لەوماڵەی بخوات چونكە ئەویش لەم كاتەدا پێویستی بەیارمەتی دان هەیە، دەڵێن جارێك پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەرمان ﷺوتی: من كەمدەستم و هیچم نیە بەڵام هەتیوێكم لایە دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموێ: { كُلْ مِنْ مَالِ يَتِيمِكَ غَيْرَ مُسْرِفٍ وَلَا مُبَادِرٍ وَلَا مُتَأَثِّلٍ /ابوداود.الالباني:حسن صحيح/ لەماڵی هەتیوەكەت بخۆ بەڵام زیادەڕەوی مەكەو پەلە مەكە بۆخواردنیو هەڵی نەگریت بۆ خۆت}ئینجا باسی ڕەوشتی **دووهەم**: دەكاتو دەفەرموێ:

﴿١٨﴾ جا ئێوە خەڵك هەڵنانێن بۆ خواردن دان بە نیازمەندانو كەمدەستان، واتە پێویستە لەسەر بڕواداران هەروەكو خۆیان چاكە دەكەن خەڵكی تریش هەڵبنێن لەسەر چاكەكردنو نەڵێن ئێمە هەر بەرپرسیاری خۆمانینو بەس. ئینجا خوی **سێهەم** باسدەكاتو دەفەرموێ:

﴿١٩﴾ خۆ ئێوە ماڵی میراتیش دەخۆن بە خواردنێكی نادروستو ناڕەواو بەشی خاوەن مافەكان نادەنو گوێتان لە حەرامو حەڵاڵ نیەو هەر ماڵتان دەست بكەوێت ئیتر بەلاتانەوە گرنگ نیە لەكوێوە بێت ئەوەندە ماڵ خۆشەویستن وەك لەبارەی **چوارهەمین** خوی خراپدا دەفەرموێ:

﴿٢٠﴾ جا ئێوە ماڵتان زۆر زۆر خۆشدەوێت بەشێوەیەك لە هەر كوێوەبێت وەریدەگرنو كە ماڵیشتان ببێت عەمباری دەكەنو دەستگیرۆی نیازمەندو كەمدەستان ناكەن. ئینجا خوای خاوەن دڵەكان بەپەلە گەشتێك بە دڵەكان دەكاو ڕایاندەوەشێنێتو وریایان دەكاتەوەو دەفەرموێ:

﴿٢١﴾ بەڕاستی دنیا ئاوا نیە كە ئەوان بیری لێدەكەنەوە بەڵكو ئەو كاتەی كە زەوی كوتێنراو پانكرایەوەو چیاكانو دەریاكان نەمانو مرۆڤ هەموی زیندوكرایەوەو لە مەیدانی كۆكردنەوەدا ئامادەكران.

﴿٢٢﴾ جاپەروەردگارت هاتو فریشتەكانیش چین چین وەستان. (چۆنیەتی هاتنی پەروەردگار لە وەسفە كرداریەكانی خوایە وەكو باقی وەسفە زاتیو فیعلیەكانی تری خوا كە باسكراون، سەلامەتترین ڕێگا ئەوەیەكەبڵێین: باوەڕمان پێی هەیە بەو شێوەی كە هاتوە، بەڵام چۆنیەتیەكەی نازانین). ئینجا دەفەرموێ:

﴿٢٣﴾ جا دۆزەخ دەهێنرێتو خەڵك بەچاوی خۆی دەیبینێت، ئەوسا ئەو ڕۆژە مرۆڤ بیردەكاتەوە كە چی كردوەو دەبێت چۆن ڕزگاری ببێت، بەڵام تازە ئەو بیركردنەوەیە هیچ سوودێكی پێنادات وەك دەفەرموێ: دەی چ سوودێكی هەیە بۆی ئەو بیركردنەوە، بەڵێ خراپەكاران لەم دنیادا گوێ ناگرن لە قورئانو فەرمودەكانی پێغەمبەرمان ﷺ و هەرچی لە دەستیان بێت لە خراپەو تاوان كۆتایی ناكەن بەڵكو زۆر جار خۆیشیانی پێهەڵدەكێشن لەناو هاوسەرانیاندا، بەڵام خۆ ئەو ڕۆژە ئەو پیاوە نین.

﴿٢٤﴾ بەڵكو بە شەرمەندەییو ترسەوە دەڵێن: خۆزگە من شتی چاكم بكردایە بۆ ئەم ژیانەم. بەڵێ ئەوانەی كەوا لە دنیادا گوێ لە قورئان و فەرمودە ڕاستەكانی پێغەمبەرمان ﷺ ناگرنو گاڵتە بە ڕەوشتو سیمای باوەڕداران دەكەن، لەو ڕۆژەدا قەپ بە دەستی خۆیاندا دەكەنو پەشیمان دەبنەوە لەو ڕەفتارە خراپەیان بەڵام پەشیمان بونەوە هیچ سودێكیان پێنادات، جا با بەر لە هاتنی ئەو ڕۆژە بیربكەنەوەو پەشیمان ببنەوە، چونكە خوا زۆر میهرەبانەو پەشیمانبونەوەیان لێوەردەگرێت ئەگینا كۆتو زنجیرو سزای سەختیان لەبەردەمدایە وەك دەفەرموێ:

﴿٢٥﴾ جا ئەو ڕۆژە هیچ كەس ناتوانێت سزایەك بدات بە وێنەی ئەو سزا سەختەی اللَّهُ.

﴿٢٦﴾ وە هیچ كەسێكیش كۆتو زنجیر ناكات كە سەختتر بێت لەو كۆتو زنجیرەی خوا بۆخوانوناسو تاونباران.

واتە: هەمو جۆرە سزاكانی دنیای تاوانباران بۆ چەوساوەو ستەم لێكراوان بخەیتە سەریەك ناگاتە سەختی سزای ئەو ڕۆژەی خوا بۆتاوانباران، وە هەمو كۆتو زنجیری تاوانبارانی دنیا بۆ ژێردەستەو ستەم لێكراوان ناگاتە ئێشو ئازاری كۆتو زنجیری ئەو ڕۆژەی اللَّهُ، ئاشكرایە ئەم سزاو كۆتو زنجیرە بۆ تاوانبارانەو خاوەن باوەڕانی ڕاستەقینە لەو ڕۆژەدا سەربەزو دڵخۆشنو چاوەڕوانی جێگای خۆشترو پلەی بەرزتر دەكەنو خوا دەفەرموێ:

(٢٧) ئەی گیانە ئارامگرو دامەزراوەکە.

(٢٨) بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگار ی خۆت بە ڕەزامەندی بەوچاکانەی کەلە گەڵتا دەکرێت کەرازی دەکرێیتو بەهۆی ئەو چاکانەش کەکردوتە خوات لە خۆت ڕازی کردوە،

(٢٩) دەی بچۆرە ناو بەندە چاكوبەرێزەکانی منەوە

(٣٠) وە بچۆرە ناو بەهەشتی منەوە. هەندێك لە تەفسیرنوسان دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی (**عوسمان**)ی کوڕی عەفان خەلیفەیسێهەمی موسڵمانان دابەزیووەو هەندێکیش دەڵێن: دەربارەی (**حمزە**)ی کوڕی عەبدولموتەلیب ی گەورەی هەمو شەهیدانەوە هاتوە، دەشگونجێت دەربارەی هەردووکیان دووجار دابەزیبێت. والله أعلم. جا تەماشای ئەو لوتفو ڕێزە گەورە بکەن کە خوا دایناوە بۆ بەندە چاکەکانی. (خوا لەو چاکانەمان حیساب بکات) امین.

## ٩٠ سورەتی بەلەد ٢٠

سورەتی بەلەد کە نەوەدهەمین سورەتی قورئانە لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوەو بیست ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سیو پێنجەمین سورەتەو پاش سورەتی (**ق** )و پێش (**تاریق**) دابەزیوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) وانیە، سوێند بەم شارە کە مەکەیە .

(٢) جا تۆ ئێستا لەو شارەدای و هەمو خراپەیەك لەو شارەدا قەدەغەیە، کەچی ئەوان ئێشو ئازاری زۆر دروست دەکەن بۆ تۆو بە ئازاردانی پەیڕەوانت دڵت بریندار دەکەن، پێغەمبەرمان لە ڕۆژی فەتحی مەکەدا فەرموی:{ فَإِنَّ هَذَا بَلَدٌ حَرَّمَ اللَّهُ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ وَهُوَ حَرَامٌ بِحُرْمَةِ اللَّهِ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ وَإِنَّهُ لَمْ يَحِلَّ الْقِتَالُ فِيهِ لِأَحَدٍ قَبْلِي وَلَمْ يَحِلَّ لِي إِلَّا سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ / متفق عليه/ جا بێگومان ئەمە شارێکە لەوڕۆژەوە کە خوا ئاسمانانو زەوی دروستکردوە هەموجۆرە ستەمو کوشتارێکی تێدا قەدەغەکردوەو هەروایش قەدەغەیە بەقەدەغەکردنێکی خوایی هەتا ڕۆژی قیامەت، بێگومان شەڕ تێیدا حەڵاڵ نەبوە بۆهیچ کەسێك پێش منو بۆ منیش تەنها سەعاتێك لەڕۆژ حەڵاڵ بوە} بۆیە هەندێ لە ڕاڤەکاران پێیان وایە مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە کە شاری مەکە بۆ تۆ: ئەی پێغەمبەر ﷺحەڵاڵ کراوە کە کێت دەوێ لە دوژمنانت دەتوانی لەم شارەدا بیکوژێت جا پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی فەتحی مەکەدا فەرمانی کوشتنی کەسانێکی دا کە لەوانە ئیبنو خەتەل.

يَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي قَدَّمۡتُ لِحَيَاتِي ﴿٢٤﴾ فَيَوۡمَئِذٖ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٥﴾ وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُۥٓ أَحَدٞ ﴿٢٦﴾ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ ﴿٢٧﴾ ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ﴿٢٨﴾ فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ﴿٢٩﴾ وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ﴿٣٠﴾

٩٠ سُورَةُ البَلَدِ ٢٠

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لَآ أُقۡسِمُ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿١﴾ وَأَنتَ حِلُّۢ بِهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ﴿٢﴾ وَوَالِدٖ وَمَا وَلَدَ ﴿٣﴾ لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِي كَبَدٍ ﴿٤﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّن يَقۡدِرَ عَلَيۡهِ أَحَدٞ ﴿٥﴾ يَقُولُ أَهۡلَكۡتُ مَالٗا لُّبَدًا ﴿٦﴾ أَيَحۡسَبُ أَن لَّمۡ يَرَهُۥٓ أَحَدٌ ﴿٧﴾ أَلَمۡ نَجۡعَل لَّهُۥ عَيۡنَيۡنِ ﴿٨﴾ وَلِسَانٗا وَشَفَتَيۡنِ ﴿٩﴾ وَهَدَيۡنَٰهُ ٱلنَّجۡدَيۡنِ ﴿١٠﴾ فَلَا ٱقۡتَحَمَ ٱلۡعَقَبَةَ ﴿١١﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡعَقَبَةُ ﴿١٢﴾ فَكُّ رَقَبَةٍ ﴿١٣﴾ أَوۡ إِطۡعَٰمٞ فِي يَوۡمٖ ذِي مَسۡغَبَةٖ ﴿١٤﴾ يَتِيمٗا ذَا مَقۡرَبَةٍ ﴿١٥﴾ أَوۡ مِسۡكِينٗا ذَا مَتۡرَبَةٖ ﴿١٦﴾ ثُمَّ كَانَ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡمَرۡحَمَةِ ﴿١٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَيۡمَنَةِ ﴿١٨﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا هُمۡ أَصۡحَٰبُ ٱلۡمَشۡـَٔمَةِ ﴿١٩﴾ عَلَيۡهِمۡ نَارٞ مُّؤۡصَدَةُۢ ﴿٢٠﴾

٩١ سُورَةُ الشَّمۡسِ ١٥

(٣) جا سوێند بە باوكو بە منداڵەکانی کە ئادەمو نەوەکانیەتی، واتە پاش ئەوەی کە خوا سوێندی بەو جێگا پیرۆزە خوارد سوێندی بەو کەسەیش خوارد کە پێشەکی لەو جێگادا بوە کە ئادەمو منداڵەکانیەتی، هەندێك وتویانە مەبەست پێغەمبەرو ئومەتەکەیەتی وەك لە فەرمودەدا هاتوە کە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{ إِنَّمَا أَنَا لَكُمْ بِمَنْزِلَةِ الْوَالِدِ أُعَلِّمُكُمْ /ابوداود،حسنه الألباني/ من بۆ ئێوە هەر وەکو باوکێك وام کە شارەزایی ئایینتان دەکەم} هەندێکیش دەڵێن: مەبەستی ئیبراهیمو نەوەکانیەتی کە پێغەمبەرمان ﷺ یەکێکە لە نەوەکانی، جا ئەگەر هەروا بە گشتی مانای بکەین هەموویان دەگرێتەوە واتە: سوێند بە مرۆڤ هەر لە ئادەمەوە هەتا کۆتایی نەوەی ئادەم (خوا لێی ڕازی بێت) ئینجا اللّٰه پاش ئەو سێ سوێندە دەفەرموێ:

(٤) بەڕاستی مرۆڤمان دروستکردوە بەشێوەیەکی ڕێك و پێكو هەمیشە لە ڕەنجو زەحمەتو تەلاشدایە هەر لەو کاتەوە کە بەئەندازەی گەردیلەیەکە لە سکی دایکیدا خەریکی تەلاشو زەحمەتە بە ڕێنماییو فەرمانی خوا هەتا ئەو کاتەی دێتە دنیاو گەورە دەبێتو دەمرێتو زیندو دەکرێتەوە.

(٥) ئایا وا دەزانێت کەس توانای نیە بەسەریداو خۆی هەرچی بکاتو بیەوێت نابێ لێپرسینەوەی هەبێت؟ نەخێر وانیەو

پرسیاری لێدەكرێت لە هەموو بابەتێكەوە بە تایبەت لەبارەی ئەو سەروەت و سامانەی كە لە دەستیدابووە.

(٤) كەدەڵێت ماڵێكی زۆرم خەرجكردووە، واتە شانازی دەكات بەو هەموو ماڵەی كە لە دنیادا خەرجی كردووەو لەناو خەڵكی دا باسی دەكات و بەوماڵە لە خۆی بایی دەبێت كە لەم ئایەتەدا پەروەردگار خەرج كردنی ماڵ لە ڕێی دنیادا بە "لەناوبردن" ناوی دەبات، چونكە بەڕاستی هەرماڵێك لەڕێی پەروەردگاردا خەرج نەكرێت ئەوە بەڕاستی لەناو بردنە، جا مرۆڤی ئاوا چۆن بیروبۆچوونێكی هەیەو چۆن گومان دەكات.

(٧) ئایائەم جۆرە مرۆڤە وادەزانێت كەس نایبینێت كەچی كردووەو لەچیدا ئەوماڵەی خەرج كردووە؟ ئینجا خوا باسی چەندنیعمەتی گرنگی خۆی دەكات و دەفەرموێ:

(٨) ئایا ئێمە دوو چاومان بەو نەداوە كە شتیان پێ ببینێت؟ جا دەگونجێت ئەو كەسەی كە چاوی دابێت بە تۆ خۆی چاوی نەبێت كەتۆ ببینێت؟ وتراوە (فَاقِدُ الشَّيء لايُعطِيه/ كەسێ هیچی نەبێت چی دەدات بەخەڵك.)ئاشكرایە ئەوكەسەی كەچاوی بەتۆداوە دەبێ خۆیشی چاوی هەبێت. ئینجا باسی نیعمەتی دووهەم و سێهەم دەكات و دەفەرموێ:

(٩) وە ئایا ئێمە زمانمان بەو نەداوە كە بتوانێت ئەوەی لەناو دڵیدایە بەجوانی ڕۆشنی بكاتەوە بۆ خەڵك و شتی پێ تام بكات و تیكەی پێ ئەمدیوو ئەودیو بكات؟ جا ئایا ئێمە دوو لێومان بەو نەداوە كە یارمەتی بدات بۆ جوان قسەكردن و شاردنەوەی ددانەكانی و جوان جواندنی پارو؟ سەرەڕای ئەم نیعمەتە بەنرخانەیش دەستی مرۆڤی گرتووەو ڕاست و خراپی پیشان دەدات وەكو دەفەرموێ:

(١٠) ئەوسا ئێمە ڕێنمایمان كردووە بۆ دوو ڕێگای ڕاست و ناڕاست، چاك و خراپ، دەشگونجێت بە مانای ڕێنمایمان كردووە بۆ مژینی هەردوو مەمكی دایكی بەڵام لە مانای پێشوودا ئەوەش دەگرێتەوە، ئینجا دەفەرموێ:

(١١) ئای ئەو پلە سەختە نابڕن.

(١٢) چی تۆی تێگەیاندوە كەئەوپلەسەخت چیە؟ ئینجا مانای ئەو پلە سەختەمان بۆ ڕوون دەكاتەوەو دەفەرموێ:

(١٣) ئازادكردنی گەردنە چ بەندە بێت و ئازادی بكات و چ ئازادێك گرفتار بێت و ڕزگاری بكات چ گەردن ئازادكردنی خەڵك بێت لەمافێك كەبەسەریانەوەیە هەركامیان بێت ئازادكردنی گەردنەو شتێكی زۆر بەنرخ و گرنگە بەوجۆرە ئازاد كردنانە مرۆڤ ئەو پلە سەختە دەبڕێت.

(١٤) یان خۆراكدانە لە ڕۆژی برسێتی و گرانی و تەنگانەدا.

(١٥) بەخزمی هەتیوی، چونكە چاكەكردن لەگەڵ خزمدا دوو سودی هەیە، یەكەم چاكەیەو دووهەم بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتیە وەكو پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ { الصَّدَقَةُ عَلَى الْمِسْكِينِ صَدَقَةٌ وَهِيَ عَلَى ذِي الرَّحِمِ اثْنَتَانِ صِلَةٌ وَصَدَقَةٌ/النسائي، صححه الألباني/ واتە: چاكە لەگەڵ نەداراندا یەك چاكەیە، بەڵام لەگەڵ خزمدا دووانە، **یەك**: چاكەیەو **دوو**: پەیوەندی خزمایەتیە}، ئینجا دەفەرموێ:

(١٦) یان خۆراك دان بە نەدارێكی بێكەس وكارو قەرزارو منداڵدار.

(١٧)پاش ئەو ئیشە گرنگانە ئەمەش بزانە كە لەو گرنگتر ئەوەیە كە دەبێت ئەو چاكەكارە لەو كەسانە بێت كە باوەڕیان هێناوە، چونكە بە بێباوەڕبون هیچ شتێكی چاك سودی نابێت بۆی و لەلای خوا هیچ نرخێكی نیەو ئامۆژگاری یەكتر دەكەن بۆ خۆگری لەسەر بەندایەتی و خۆگری لە تاوان و خۆگری لەكاتی تەنگ و چەڵەمەو زیان لێ كەوتندا، وە ئامۆژگاری یەكتر دەكەن لەسەر بەزەیی هاتنەوە بە خەڵكدا، لە فەرمودەدا هاتوە كە: { مَنْ لَا يَرْحَمِ النَّاسَ لَا يَرْحَمْهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ/مسلم وغیره/ هەركەسێك كە بەزەیی بە خەڵكدا نەیەتەوە خوای دەسەڵاتدار و گەورە بەزەیی بەودا نایەتەوە}.

(١٨) ئەوانەی كە ئەو وەسفە بەنرخانەیان تێدابێت، ئەوانە كەسانێكن كە نامەی كردەوەیان بە دەستی ڕاست پێدەدرێت و سەرفەرازو بەختەوەر دەبن. جا هەروەكو باوی قورئان مادام باسی چاكەكاران و پاداشتەكانیانی كرد وا باسی خراپەكاران و سزاكانیان بەشێوەیەكی كورت و جەرگبڕ دەكات و دەفەرموێ:

(١٩) جا ئەوانەی كە بێباوەڕن بە نیشانەكانی ئێمە ئەوانە هاوڕێی دەستە چەپن واتە نامەی كردارەكانیان بە دەستی چەپ پێدەدرێت و شەرمەندەو ڕو ڕەشن لەو ڕۆژەدا.

(٢٠) كە ئاگرێك دایپۆشیون هەرگیز لێی ڕزگار نابن و هیچ دەرگایەكی نیە تا هیوای دەرچونیان بێت، وشەی (مؤصدة) بە مانای داگیركردن و بە مانای داخراو هاتووە.

(اَللّٰهُ پەنامان بدات لەو ئاگرە، ئامین یارب العالمین).

## ٩١ سورەتی شەمس ١٥

سورەتی شەمس کە نەوەدو یەکەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، پانزە ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین بیستو شەش هەمین سورەتەو پاش سورەتی (القدر)و پێش (البروج) دابەزیوە، لە پێشەوە باسمان کرد کە پێغەمبەر ﷺبە مەعازی فەرمو: ئەی بۆ نوێژت نەکرد بە خوێندنی سورەتی (الاعلى) و(الشمس) و(الليل)؟.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١)سوێند بەخۆر بە ڕوناکیو ڕۆژەکەیشی.

(٢)جاسوێند بە مانگ کاتێك کە دێت بەدوای ڕۆژدا (خۆر).

(٣) سوێندیش بە ڕۆژ کاتێك خۆر بەتەواوی ئاشکرا دەبێتو دەبێت بەهۆی گەڕانو هەوڵدانی مرۆڤ بۆ بەدەستهێنانی بژێویو فێربونو یاد دان.

(٤)سا سوێند بە شەو کاتێك کە ڕۆژ دادەپۆشێتو تاریکایی دێنێتو دەبێت بەهۆی ئارامگرتنو حەسانەوەی مرۆڤ.

(٥)سوێندیش بە ئاسمانو سوێند بەو زاتەیش کە ئەوی دروستکردوە.

(٤) جا سوێند بە زەویو بەوزاتەی کە ئەوی ڕاخستوە.

(٧) ئەوسا سوێند بە نەفسو ئەو پەروەردگارەی کە نەفسی ڕێكوپێك کردوەو داینراوە لەسەر بیروباوەڕو خواناسی. وەك پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ:{ يَقُولُ اللهُ عَزَّ وَجَل: وَإِنِّي خَلَقْتُ عِبَادِي حُنَفَاءَ كُلَّهُمْ وَإِنَّهُمْ أَتَتْهُمْ الشَّيَاطِينُ فَاجْتَالَتْهُمْ عَنْ دِينِهِمْ / رواه مسلم/ خوای دەسەڵاتدارو بەشکۆ دەفەرموێ: من بەندەکانی خۆمم وا دروستکردوە کە لابدەن لە هەمو چەوتیەكو ڕێگای خواپەرستی بگرن، جا شەیتانەکان هاتنو لایاندان لە ئاینەکەیان).

(٨)ئینجا تێیگەیاند کە چ شتێك ئەو دڵە خراپ دەکاتو چ شتێك پاکی دەکاتەوەو یارمەتیشی دەدات بۆ هەرکامیان کە خۆی هەڵیدەبژێرێت، یان لە نەفسانی خراپەکار خراپەو لە نەفسانی چاك پاکیو تەقوای دانا، عیمرانی کوڕی حوصەین دەڵێت: دوو پیاو لەخێڵی مۆزەینە هاتنە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ جا پرسیاریان کرد: ئەی پێغەمبەر ئایا ئەوەی کە خەڵك ئەمڕۆ دەیکەنو هەوڵی بۆدەدەن ئایا لە قەزاو قەدەردا بڕاوەتەوە یان ئەوەیان پێدەگات کەبە هۆی ئەوەی کە پێغەمبەرەکەیان بۆی هێناونو بەڵگەیان لەسەر تەواو بوە؟ جا پێغەمبەرﷺ فەرموی:

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا (١) وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا (٢) وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا (٣) وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا (٤) وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا (٥) وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا (٦) وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا (٧) فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا (٨) قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّاهَا (٩) وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّاهَا (١٠) كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِطَغْوَاهَا (١١) إِذِ انبَعَثَ أَشْقَاهَا (١٢) فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ نَاقَةَ اللَّهِ وَسُقْيَاهَا (١٣) فَكَذَّبُوهُ فَعَقَرُوهَا فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا (١٤) وَلَا يَخَافُ عُقْبَاهَا (١٥)

## ٩٢ سُورَةُ اللَّيْلِ ٢١

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَىٰ (١) وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّىٰ (٢) وَمَا خَلَقَ الذَّكَرَ وَالْأُنثَىٰ (٣) إِنَّ سَعْيَكُمْ لَشَتَّىٰ (٤) فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَاتَّقَىٰ (٥) وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَىٰ (٦) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَىٰ (٧) وَأَمَّا مَن بَخِلَ وَاسْتَغْنَىٰ (٨) وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَىٰ (٩) فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَىٰ (١٠) وَمَا يُغْنِي عَنْهُ مَالُهُ إِذَا تَرَدَّىٰ (١١) إِنَّ عَلَيْنَا لَلْهُدَىٰ (١٢) وَإِنَّ لَنَا لَلْآخِرَةَ وَالْأُولَىٰ (١٣) فَأَنذَرْتُكُمْ نَارًا تَلَظَّىٰ (١٤)

{لَا بَلْ شَيْءٌ قُضِيَ عَلَيْهِمْ وَمَضَى فِيهِمْ وَتَصْدِيقُ ذَلِكَ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا/مسلم وغيره/ نە، بەڵکو ئەوە شتێکە کە بڕاوەتەوەو بڕیاری لەسەر ئەوان دراوەو ئەوەش کە ئەم ڕاستییە دەسەلمێنێت، ئەو ئایەتەیە کە دەفەرموێ: ﴿سوێند بە نەفسو ئەو پەروەردگارەی کە نەفسی ڕێكوپێك کردوە، جا لە نەفسانی خراپەکار، خراپەو لە نەفسانی چاك، پاکیو تەقوای دانا﴾ واتە: پەروەردگار هەمو نەفسەکانی دروستکردوەو لە عیلمو زانیاری ئەودا چاکیو خراپی هەرکامیان دیاری کراوە، جا ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە نەفسەکان خاوەنی هیچ ئیرادەیەك نین، بۆیە دەفەرموێ:

(٩)بەحەقیقەت ڕزگار بو ئەو کەسەی کە ئەو دڵەی خۆی پاك کردوە بەخواناسینی ڕاستەقینەوپارێزکاری.

(١٠) وە بە حەقیقەت ڕەنجەڕۆ بو ئەو کەسەی کە جڵەوی بۆ نەفسی خۆی شل کردو چی ویست وا جووڵایەوە. دەبێت ئەوەش بزانین کە چاکەو خراپە بەبێ ئارەزۆو بەبێ هێزی خوا ناکرێت، بەڵام خوا مرۆڤی کردوە بە سەرپشك لە هەڵبژاردنیدا، ئەو سەرپشکیەش ئیرادەو بڕیاری خوایەو بەڵگەی گەورەییو ڕێزی ئەوەی ئادەمە، چونکە زۆری لێ ناکات بۆ لایەکیان، بەڵام پێی ڕاگەیاندوە کە لەسەر چاکەکانت پاداشت هەیەو لەسەر خراپەکانت سزات بۆ هەیە. لە نزایەکی پێغەمبەرمان ﷺ دا

هاتوە كە دەفەرموێ: { اللَّهُمَّ آتِ نَفْسِي تَقْوَاهَا وَزَكِّهَا أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاهَا أَنْتَ وَلِيُّهَا وَمَوْلَاهَا / مسلم،أحمد/ ئەی پەروەردگارم پارێزکاری ببەخشی بە نەفسمو پاکی بکەرەوە تۆ چاکترینی هەمو پاکۆکەرانی تۆ سەرپەرشتی ئەوی‌و بەدەست تۆیە کاروباری ئەو}

ئینجا خوای گەورە داستانی گەلی سەمودمان بە کورتی بۆ باسدەکاتو دەفەرموێ:

(١١) بێباوەڕبون گەلی سەمود بە پێغەمبەرەکەیان بەهۆی خراپی‌و سەرکەشیانەوە.

(١٢) بەتایبەت لەو کاتەدا کە خراپترین کەسیان دەرپەڕی کەپیاوێك بوو خۆی ئامادەکرد بۆ کوشتنی ئەو وشترەی کە موعجیزەیەك بو لەموعجیزەکانی صالح پێغەمبەر(سەلامی خوای لێبێ) کە پێغەمبەرمان لەبارەیەوە دەفەرموێ:{ انْبَعَثَ لَهَا رَجُلٌ عَزِيزٌ عَارِمٌ مَنِيعٌ فِي رَهْطِهِ مِثْلُ أَبِي زَمْعَةَ /البخاري/ پیاوێك هەستا بۆ ئەو ئیشە کە پیاوێکی کەم وێنەو بەشەهامەتو لێهاتو بو لەناوگەلەکەی خۆیدا، وەك ئەبو زەمعە}.

(١٣) بەو مەرجەیش کە پێغەمبەرەکەیان پێی وتن : ئەو وشترە لەلایەنی خواوە لەسەر داخوازی خۆتان وەك بەڵگەیەکی گرنگ لەسەر ڕاستی من هاتوەو نەکەن بەنیازی خراپەوەنزیکی ببنەوەو واز لە بەشە ئاوەکەی بهێنن.

(١٤) کەچی ئەوان باوەڕیان بەو نەکردو بەدرۆیان خستەوەو چوون وشترەکەیان سەربڕی ئیتر بەو هۆیەوە خوا ڕقی هەستا لێیان‌و سزای بۆ ناردن، جاچونکە هەمویان بەشدار بون لە دژایەتی سالْح داو هەمویان بەو ئیشە ڕازی بون، ئەوسا خوا هەمویانی لەو سزادا بەشدار کردو هەمویانی بەنرکە و ناڵەیەك لەناوبرد.

(١٥) خۆ خوا ناترسێت لە ئایندەی ئەو سزایە کە ناردیە سەر ئەو گەلە تاوانبارە واتە خوا لە تۆڵەی کەس ناترسێت، چونکە کەس ناتوانێت زیان بەو بگەیەنێت.

لێرەدا پێویستە لەسەر ئێمەی موسڵمان بەخۆماندا بچینەوە چونکە هەمومان ئاگامان لە ستەمو تاوانە کانی ئەم سەردەمە هەیە کە بە شەوو بە ڕۆژ لەدژی خواو پێغەمبەرو ئیسلام موسڵمانان دەکرێتو کەسیش نارازی نیە لێی‌و ڕای خۆی دەرنابڕێت، ئاشکرایە بکوژی وشترەکە یەك کەس بو بەڵام خوا تۆڵەی لە هەمویان وەرگرت چونکە ئەوانیش بەوە ڕازی بون لەراستیدا بێدەنگی بەڵگەی ڕازی بونە بەوتاوانانە دەی دەبێ چاوەڕوانی سزای سەختی خوابکەین.

پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الْمُنْكَرَ وَلَا يُغَيِّرُوهُ أَوْشَكَ اللَّهُ أَنْ يَعُمَّهُمْ بِعِقَابِهِ/أحمد،صححه الألباني/ بەراستی خەڵك ئەگەر خراپەیان بیناو نەیانگۆڕی زۆر نزیکە ﷻ هەمویان بەتێکرای توشی سزای خۆی بکات}.

## ٩٢ سورەتی لەیل ٢١

سورەتی لەیل یان ﴿وَٱلَّيۡلِ﴾ کە نەوەدو دووهەمین سورەتی قورئانە، لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوەو بیستو یەك ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین نۆهەمین سورەتەو پاش سورەتی (الاعلى)و پێش (الفجر) دابەزیوە. ئەم سورەتە لەو سورەتانەیە کە پێغەمبەرمان ﷺ بە مەعازی فەرمو: بۆ ئەو سورەتانە ناخوێنی کاتێك پێش نوێژی دەکەیت بۆ خەڵك.

بەناوی‌اللهی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە شەو کاتێك کە دروستکراوەکانی ﷻ بە تاریکاییەکەی دادەپۆشێت.

(٢) جا سوێند بە ڕۆژ کاتێك کەئاشکرا دەبێتو زەوی ڕۆشن دەکاتەوە بەروناکییەکەی.

(٣) سوێند بەو کەسەیش کە نێرو مێی دروستکردوە، جا هەروەکو سوێندپێخوراوەکان دژی یەکن (شەو – ڕۆژ، نێر-مێ) هەروا تەلاشو ئیشی بەندەکانی خودایش لەیەك جیان، وەکو دەفەرموێ: سوێند بەوانە،

(٤) بێگومان کە تەلاش‌و کۆششی ئێوە لەیەك جیان، هەتانە بە شەوو ڕۆژ بە خواناسی‌و چاکەکاریەوە خەریکەو وایشتان تێدایە کە شەوو ڕۆژ بە تاوان‌و کوفرو خراپەکاریەوە سەرگەرمە جا ئاشکرایە ئەوانە هەروەکو تەلاشەکانیان وەکو یەك نیە نابێت پاداشتەکانیشیان وەکو یەك بێت وەك دەفەرموێ:

(٥) جا ئەو کەسەی کە بەخشی ئەوەی کە داوای لێکراوەو لە خوا ترساو خۆی پاراست لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشە.

(٦) جا باوەڕیشی بە بەهەشتو ئەو پاداشتە گەورەیە هێنابو، وە بۆ گەیشتن بەو شوێنە بەنرخە لە هیچ ئیشێکی چاك کۆتایی نەکردبو،

(٧) دەی ئیتر ئێمەیش ئەو ئامادە دەکەین بۆ ئیشی ئاسان کە چاکەو بەندایەتی خوایە، چونکە ئەگەر بیروباوەڕی پاك کرایەوە لە خراپەو شیركو چاك خوای خۆی ناسی‌و گەڕایەوە سەر ئەو باوەڕەی کە لەسەری بوە کە خواپەرستیە، ئەوسا ئەنجامدانی

ئیشی چاك لەلای ئەو کەسە ئاسان دەبێت، وەکو کەسێك وایە بەناو رووبارێکدا بەرەو رۆیشتنی رووبارەکە بڕوات.

عەلی کوڕی ئەبوتالیب دەڵێت: پێغەمبەرمان ﷺ فەرموی:{ مَا مِنْكُمْ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا وَقَدْ كُتِبَ مَقْعَدُهُ مِنَ النَّارِ وَمَقْعَدُهُ مِنَ الْجَنَّةِ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفَلَا نَتَّكِلُ عَلَى كِتَابِنَا وَنَدَعُ الْعَمَلَ قَالَ اعْمَلُوا فَكُلٌّ مُيَسَّرٌ لِمَا خُلِقَ لَهُ أَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ السَّعَادَةِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ السَّعَادَةِ وَأَمَّا مَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الشَّقَاءِ فَيُيَسَّرُ لِعَمَلِ أَهْلِ الشَّقَاوَةِ ثُمَّ قَرَأَ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى الْآيَةَ/ متفق عليه/ هیچکام لە ئێوە نیە مەگەر جیگای لە ئاگر و جێگای لە بەهەشت بۆدیاری کرابێ، جا وتیان: ئەی پێغەمبەری خواﷺ دەی ئایا پشت نەبەستین بەوەی کە بۆمان دیاری کراوەو واز بهێنین لە کردار؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: هەوڵ بدەنو کردەوە بکەن جا هەر کەس بۆ کوێ نوسراوە رێی بۆ ئاسان دەکرێت، جا ئەوەی کە لە بەختەوەرانە کردارو ئیشی بەختەوەرانی بۆ ئاسان دەکرێت، بەڵام هەرکەس لە بەدبەختان بێت کردارو ئیشی چارەڕەشانی بۆ ئاسان دەکرێت پاشان ئەم ئایەتانەی خوێندەوە:﴿ جا ئەو کەسەی کە بەخشیو لە خوا ترساو باوەڕی بە بەهەشت بو، ئەوسا ئێمەیش ئەو ئامادە دەکەین بۆ ئیشی ئاسان﴾}

واتە ئەوانە کە باوەڕ دەهێننو ئیشی چاك دەکەن پەروەردگار ئەنجامدانی ئیشی چاکیان بۆ دەڕەخسێنێت، بەڵام ئەوانەی کە دژایەتی ئایین بکەن چونکە دژایەتی بناغەی خۆیانە سەختەو وەکو کابرای ناو ڕوبارەوە بەرەو پێچەوانەی هاتنی رووبارەکە بڕوات وەك دەفەرموێ:

(٨) خۆ ئەو کەسەی کە ڕژدی کردبێت لەو شتەی کە خوا پێی بەخشیوەو نەیبەخشێت و خۆی بێنیاز بزانێتو منەتی بەخوا نەبوبێت.

(٩) وە باوەڕی بە بەهەشت نەکردبێت

(١٠) دەی ئیتر ئێمە ئەو ئامادەی هەڵگرتنی باری سەخت دەکەینو وای لێدێت هیچ خراپەو تاوانێکی لەلا گرنگ نابێتو بێ پسانەوە لە تاوانکردندایەو تاوان، تاوان ڕادەکێشێتو نەفسو شەیتان ئەو تاوانانەی زۆر بۆ جوان دەکەن، تا سەرئەنجام بەو شێوە نالەبارەوە لە دنیا دەردەکرێتو ڕاپێچی گۆڕو لێکۆڵینەوەی دەکەین، جا ئەو کاتە دەزانێ چەندە نەزانو نەفامو گەوج بوە چونکە نە ماڵو نە سامانە زەحمەت بۆکێشراوەکەی نەگەیشتنە فریای، وەك دەفەرموێ:

(١١) خۆ ماڵەکەی ئەو سوودێکی بەو نەدا نە ئەو کاتەی کە لەناوچووەو نە ئەو کاتەی کە کەوتوتەناو دۆزەخەوە، ئینجا دەفەرموێ:

لَا يَصْلَىٰهَآ إِلَّا ٱلْأَشْقَى (١٥) ٱلَّذِى كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ (١٦) وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلْأَتْقَى (١٧) ٱلَّذِى يُؤْتِى مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ (١٨) وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعْمَةٍ تُجْزَىٰٓ (١٩) إِلَّا ٱبْتِغَآءَ وَجْهِ رَبِّهِ ٱلْأَعْلَىٰ (٢٠) وَلَسَوْفَ يَرْضَىٰ (٢١)

## سُورَةُ الضُّحَىٰ ٩٣ ١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلضُّحَىٰ (١) وَٱلَّيْلِ إِذَا سَجَىٰ (٢) مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ (٣) وَلَلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ ٱلْأُولَىٰ (٤) وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَىٰٓ (٥) أَلَمْ يَجِدْكَ يَتِيمًا فَـَٔاوَىٰ (٦) وَوَجَدَكَ ضَآلًّا فَهَدَىٰ (٧) وَوَجَدَكَ عَآئِلًا فَأَغْنَىٰ (٨) فَأَمَّا ٱلْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ (٩) وَأَمَّا ٱلسَّآئِلَ فَلَا تَنْهَرْ (١٠) وَأَمَّا بِنِعْمَةِ رَبِّكَ فَحَدِّثْ (١١)

## سُورَةُ الشَّرْحِ ٩٤ ٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ (١) وَوَضَعْنَا عَنكَ وِزْرَكَ (٢) ٱلَّذِىٓ أَنقَضَ ظَهْرَكَ (٣) وَرَفَعْنَا لَكَ ذِكْرَكَ (٤) فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا (٥) إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا (٦) فَإِذَا فَرَغْتَ فَٱنصَبْ (٧) وَإِلَىٰ رَبِّكَ فَٱرْغَب (٨)

(١٢) بەبێگومان ئێمە پێویستمان کردوە لەسەر خۆمان کە ڕێگای ڕاستو ناڕاست لە یەك جیابکەینەوە بۆ بەندەکانمان، ئەوەتە خوای میهرەبان ئەو هەمو پێغەمبەرانەو ئەو هەمو پەڕاوانەی ناردوە بۆ ئەوەی مەردوم چاكو خراپ بزاننو هیچ کەس بەهانەی نەبێت لە ڕۆژی قیامەتداو هەر بە وەرگرتنەوەی نامەی کردارەکانی، خۆی دان بنێت بە تاوانی خۆیداو بەرەو جێگای دیاریکراوی مل بنێتو بڕوات، چونکە لە ڕاستیدا هاتنی مرۆڤ بۆ ئەم جیهانە تەنها بۆ تاقیکردنەوەیەو بەس. ئینجا دەفەرموێ:

(١٣) وە بەبێگومان هەر موڵکی ئێمەیە دوارۆژو ئەمڕۆیش واتە : دنیاو قیامەت هەر موڵکی اللهیەو کەس بۆی نیە لە موڵکی ئەو زاتەدا بەبێ فەرمانی ئەو هەڵسو کەوت بکات، جا ئەگەر لە دنیادا مرۆڤ کراوە بە سەرپشكو خۆیەتی ڕێگای ڕاست یان چەوت هەڵدەبژێرێت، چونکە تاقی دەکاتەوە، بەڵام دەبێ بزانێت:

یەکەم: هەرکام هەڵبژێرێت بەبێ مەیلی الله نابێت.

دووهەم: هەرکامیانی هەڵبژارد ئەگەر الله یارمەتی نەدات ناتوانێت هیچ بکات، وە لە دوارۆژدا ئەم سەرپشکیەش نامێنێتو تەنها الله خۆیەتی بڕیاردەدات وەك لە سورەتی غافردا دەفەرموێ:﴿ئەوەڕۆژێکە کەئەوان دەردەکەونو هیچ کەس لەوان لەخوا خۆی ناشارێتەوە، ئەمڕۆ خاوەنیەتی بۆکێیە؟هەربۆ اللهی تەنهای بەتوانایە﴾

هەر بۆیە ﷲ ی داناو میهرەبان لەو ڕۆژە دەمانترسێنێتو دەفەرموێ:

(١٤) دەی من دەتانترسێنم بە ئاگرێکی بلێسەدار. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إنَّ أهونَ أهل النَّارِ عَذَاباً يَومَ القِيامَةِ رَجُلٌ يُوضع فِي اخمص قَدَميه جَمرَتَانِ يَغلي مِنهَا دَمَاغُه/ البخارى/ بەڕاستی ئاسانترینی سزای خەڵکی لە ڕۆژی قیامەتدا پیاوێکە کە دوو پشکۆی ئاگر لەناو ناوسکەی پێیدایە کە بەو ئاگرە مێشکی دەکوڵێت} ئینجا ﷲ دەفەرموێ:

(١٥) ناچێتە ناو ئەوئاگرەوە مەگەر ئەو کەسەی کە زۆر بەدبەخت بێت

(١٦) ئەو بەدبەختەیش ئەو کەسەیە کە بێباوەڕبوە بە خواو بە دواڕۆژو بە پێغەمبەرانو پشتی کردوەتە ئایین، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ:{كُل أُمّتي يَدخلُونَ الجَنّةَ إلا مَن أَبَى، قَالُوا: وَمَن يَأبى يارَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: مَن أَطَاعَني دَخَلَ الجَنّةَ وَمَن عَصَانِي فَقَد أَبَى/البخارى/ هەمو ئومەتم دەچێتە بەهەشتەوە، مەگەر کەسێك خۆی بەهەشتی نەوێت، وتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ کێ هەیە بەهەشتی نەوێت؟ فەرموی: هەر کەسێك بەگوێی من بکات دەچێتە بەهەشتەوەو هەر کەسێکیش سەرپێچی فەرمانی من بکات ئەوە خۆی بەهەشتی نەویستوە}. بەڵێ ئەوانەی کە تاوانبارن خۆیانن بڕیاری نەچونە بەهەشتەوە دەگرنو خوایش یارمەتیان دەدات بۆ تاوانکردن، وە ئەوانەش کە بەهەشتیان دەوێت ئەوانیش خۆیانن کۆششی بۆ دەکەنو خوایش یارمەتیان دەدات.

(١٧) جا بەم زووانە خوا ئەو پارێزکارو لەخواترسانە لەو ئاگرە سەختە دەپارێزێتو دووریان دەخاتەوە بە شێوەیەك کە ناڵەو نرکەی ئەو ئاگرەش نابیسن وەك لە سورەتی ئەنبیا دا دەفەرموێ:﴿بەبێگومان ئەوکەسانەی کە بڕیاری چونە ناوبەهەشتیان بۆ دەرچووە ئا ئەوانە لەو ئاگرەوە دور دەخرێنەوە کە هاژەو هەڵپەیشی نابیسن و ئەوان لەو ڕۆژەدا بۆ هەمیشە وان لەوجێگایەی کەپێیان خۆشە﴾. ئینجا ﷲ پێناسەیەکی ئەو پارێزکارەمان بۆ دەکاتو دەفەرموێ

(١٨) ئەو پارێزکارە ئەو کەسەیە کە ماڵی خۆی دەبەخشێت بۆ ئەوەی خۆیو ماڵەکەی پاك بکاتەوە، جا بەو شێوەیە لە تاوان پاك دەبێتەوە، وە دەبێت بە پارێزکار وەك دەفەرموێ: ﴿بێگومان چاکەکان خراپەکان لادەبات، ئەوەئامۆژگارییە بۆئەوانەی کەئامۆژگاری وەربگرن﴾ هود. ئینجا دەفەرموێ:

(١٩) وە هیچ کەسێك مافی بەسەر ئەووە نیەو هیچکەسیش حەقی بەلای ئەووەوە نیە، تا ئەو بەخشینەی پاداشتی کابرا بێتو چاکەکەی حەق بەحەق بێت .

(٢٠) چاکەو بەخشینەکەی تەنها بە مەبەستی ڕەزامەندی پەروەردگاری بڵند مەقامیەتیو بەس، بەڵێ ئەوەندە دڵپاكو ئیش چاکە خوایش دەفەرموێ:

(٢١) بەڕاستی بەم زوانە ئەو مرۆڤە چاکەکارو دڵو ئیش پاکو چاکە ئەوەندە نیعمەتی ﷲی پێدەدرێت ڕازی دەبێت، زۆرێك لە تەفسیرنوسان دەڵێن: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەبوبەکری صدیق دابەزیوە، ئاشکرایە مەبەست هەمو مرۆڤێکە کەئەو ڕەوشتە بەرزانەی هەبێت کە ئەبوبەکر سەرقافڵەیانە، ئەبوهورەیرە دەڵێت بیستم لە پێغەمبەری خواوە ﷺ کە دەیفەرمو: { من انفَقَ زَوجين مِن شيء مِن الاشياء في سَبيل الله دُعيَ مِن ابواب مِن الجَنّة –يَا عبدالله هذا خَيرٌ/السلسلهالصحيحه/ دەیفەرمو: هەر کەسێك جوتێك لە هەر شتێك ببەخشێت لە ڕێگای ﷲدا بانگ دەکرێت لە دەرگاکانی بەهەشتەوەو دەوترێت: ئەی بەندەی خوا فەرمو ئەمەیە چاکەکەت}

جا هەر کەسێك لە نوێژدا زۆرباشبو لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێت، وەهەر کەسێك لە جیهاددا زۆرچاك بوبێت لە دەرگای جیهادەوە بانگ دەکرێت، وەهەر کەسێکیش لە چاکەکردندا زۆرباش بوبێت لە دەرگای چاکەکردنەوە بانگ دەکرێت، وەهەر کەسێك لە ڕۆژووگرتندا زۆر چاك بوبێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگ دەکرێت. ئەبوبەکر وتی: خۆپێویست نیە کەسێك لەو هەمو دەرگایانەوە بانگ بکرێت هەر دەرگایەکیان بەسەو وتی: {هَل يدعى مِنها كلّها أحَدٌ يَا رَسُولَ الله؟ قَالَ: نَعم، وَأرجو أن تَكون منهُم يَا أبابكر/ البخارى/ ئایا کەسێك هەیە لە هەمو دەرگاکانیەوە بانگ بکرێت ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ پێغەمبەر ﷺفەرموی: بەڵێ، وە هیوادارم کە تۆ لەوانەبیت ئەی ئەبوبەکر}.

## ٩٣ سورەتی زوحا ١١

سورەتی زوحا یان سورەتی ﴿وَٱلضُّحَىٰ﴾ نەوەدو سێهەمین سورەتی قورئانەولە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، یانزە ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین یانزەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الفجر)و پێش (الشرح) دابەزیوە، دەڵێن پێغەمبەرمان ﷺ ناساق بو چەند شەوێك هەڵنەدەستاوە بۆ بەندایەتیکردن، (ئوموجەمیلەی خێزانی ئەبولەهەب) هاتە لایو وتی: ئەی (محمد) وا دەزانم شەیتانەکەت وازی لێ هێناویت، ئینجا ﷲ ئەم سورەتەی نارده خوارەوە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە چێشتەنگاو کە زەوی بە تەواوی ڕووناك دەبێتەوەو کاتی تەلاشەو کاتی بیرکردنەوەو عیبادەتی ڕاستانە.

(٢) سوێند بە شەو کاتێك کە هەمو شوێنێك دادەپۆشێتو کاتی حەسانەوەو ڕازو نیازی دڵو دەروون پاکانە لەگەڵ پەروەردگاری خۆیاندا، سوێند بەوانە

(٣) پەروەردگاری تۆ وازی لەتۆ نەهێناوەو ڕقی لێت نیە

(٤) بەڵکو بەدڵنیاییەوە ئایندەت چاکتر دەبێت لە پێشوت. بەڕاستی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺچاك لە دنیا تێگەیشتو هەمیشە لەبیری ڕۆژی دواییدا بو، ئیبنو مەسعود دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺلەسەر حەسیرێك ڕاکشابو کە حەسیرەکە جێگای خۆی کردبوە لەو تەنیشتەی کە بەسەریدا ڕاکشابو، کاتێك لە خەو هەستا، منیش ئەو لایەی پێغەمبەرم ﷺ تەکاندو وتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ خەبەرت پێنەداین تا شتێکمان ڕاخستایە بەسەر ئەو حەسیرەدا؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: {مَا لِي وَلِلدُّنْيَا مَا أَنَا وَالدُّنْيَا إِنَّمَا مَثَلِي وَمَثَلُ الدُّنْيَا كَرَاكِبٍ ظَلَّ تَحْتَ شَجَرَةٍ ثُمَّ رَاحَ وَتَرَكَهَا /احمد.السلسلة الصحيحة /من چ ئیشێکم هەیە بە دنیا؟! من لەکوێو دنیا لەکوێ؟! وێنەی منو وێنەی دنیا بێجگە لەوەی کە وەکو سوارێك وایە کە ماوەیەك لە سێبەری درەختێکدا بحەسێتەوە لەپاشان بڕواو درەختەکە بەجێ بهێڵێت شتێکی تر نیە} ئینجا دەفەرموێ:

(٥) سا بەم زووانە پەروەردگارت ئەوەندە شتت پێدەدات تا ڕازی دەبیت.

عەبدوڵای کوڕی عەباس دەڵێت: هەرچی سەرکەوتنی موسڵمانان بو پاش پێغەمبەرﷺبە پێغەمبەر ﷺ نیشاندرا زۆر کەیفخۆشبو، ئینجا خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە. جا ﷲ لەناو بەهەشتدا بەهەزاران کۆشکی پێداوە، لەناو هەمو کۆشکێکدا ئەوەی پێویست بێت لە هاوسەرو خزمەتچی تێیدا داناوە، بەڵێ پێغەمبەری ئازیز ﷺ هەر بەو ژیانە دڵخۆشبو، بۆیە کاتێك کە لە کۆتایی تەمەنیدا خوا خۆی کرد بە سەرپشك لەنێوان مانەوەی لە دنیادا تا کۆتایی دنیاو لەپاشدا بیخاتە بەهەشتەوە یان گەڕانەوەی بۆ لای ﷲ، کە ئەو دووهەمیانی هەڵبژارد. ئینجا ﷲ چەند نیعمەتێکی خۆی بۆ پێغەمبەرمان ﷺ دەخاتەڕوو و دەفەرموێ:

(٦) ئایا تۆ هەتیو نەبویت کە پەروەردگارت جێگای کردیتەوە؟

بەڵێ پێغەمبەرمان ﷺلە سکی دایکیدا بو باوکی وەفاتی کردوەو تەمەنی شەش ساڵان بو کە دایکیشی وەفاتی کردوە، ئینجا باپیری (عەبدولموتەلیب) بردیە لای خۆیو لە تەمەنی هەشت ساڵیدا باپیریش وەفاتی کرد، ئینجا ئەبوتالیبی مامی بردیە لای خۆیو سەرپەرشتی دەکردو زۆر ڕێزی لێ دەناو بەو شێوەیە تا لە تەمەنی چل ساڵیدا بو بە پێغەمبەرو ئەبوتالیبی مامی هەرچەند هەر لەسەر دینی باوباپیری بو زۆر لایەنگری پێغەمبەری ﷺدەکردو لە هەمو ناخۆشیەکانی ژیانی پێغەمبەردا هاوبەشی کردوە تا ئەویش وەفاتی کرد، ئینجا نەفامو بت پەرستانی قورەیش دەستیانکرد بە ئێشو ئازاردانی خۆیو یارەکانی بەشێوەیەکی زۆر بێرەحمانەولەسنور بەدەر، ئینجا ﷲ جێگای کردەوەو خەڵکی مەدینەی کرد بە یارمەتیدەریو کۆچی کردە ناویان، ئەوانیش بە هەمو شێوەیەك پارێزگاریان لێدەکرد کە ئەمە هەمو جێگاکردنەوەی ﷲ بو بۆ ئەو مرۆڤە بەنرخە ﷺ وردودی خوایش لە یارە کۆچەریو یارمەتیدەرکانی بێتو خوا لە ئێمەو ئەوانیش خۆش ببێتو لە بەهەشتی بەریندا بە دیداری ئەو پێغەمبەرە ئازیزەمان ﷺ شادبکات-امین- ئیجا دەفەرموێ:

(٧) جا پەروەردگارت تۆی لە نەناسینی ڕێگای ڕاستو ئایینوقورئان ڕزگارکردو ڕێنمایی کردیتو ڕێگای ڕاستی پیشاندایتو ئەم قورئانە بەڕێزەی پێدایت، وەکو لە سورەتی (الشوری)دا دەفەرموێ:﴿هەر ئاوەها ئێمە ڕۆحی خۆمان ناردەلات کەتۆ لەپێشدا نە بەم پەڕاوەت دزانی ونەبەم باوەڕە﴾ ئینجا دەفەرموێ:

(٨) وە تۆ هەژار بوویت خوا بێنیازی کردیت. تا هەم پلەی هەژاری خۆگر وەرگریتو هەم پلەی دەوڵەمەندی سوپاسگوزار. دەوڵەمەندی دوو جۆرە:

**یەکەم**، دەوڵەمەندی بەهۆی سەروەتو سامانی زۆرەوە،

**دووهەم**، دەوڵەمەندی بەهۆی دڵفرەوانیەوە کەلە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەرمان ﷲ ﷺ سەروەتو سامانێکی زۆری ڕژاند بەسەر پێغەمبەر ﷺو باوەڕدارانداو پێغەمبەرمان ﷺ لە حەجی ماڵئاواییدا سەد وشتری کردوە بە قوربانی، بەڵام ئەوەی گرنگ بێت دەوڵەمەندی دڵە کە دیسان خوای میهرەبان دڵی ئەو زاتەی وا فروان کردبو کە هەرچی بۆ دەهات دابەشی دەکرد بەسەر یارەکانیدا، زۆرجار خۆیو نۆ خێزانی بێشێو سەریان ناوەتەوەو جاری وابوە دوو مانگ لەو نۆماڵانەی پێغەمبەردا ﷺ ئاگر نەکراوەتەوە، ئەوەتە ئەو زاتە بەڕێزە پەنجە بۆ ئەم خاڵە ڕادەکێشێتو دەفەرموێ: {لَيسَ الغِنى عَن كَثرَةِ العَرَضِ وَلَكِن الغِنى غِنَى النَّفْسِ/متفق علیه/ دەوڵەمەندی بە زۆربونی سەروەتو سامان نیە بەڵکو دەوڵەمەندی دەوڵەمەندی دڵە}،

هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافًا وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ /رواه مسلم/ بەڕاستی ڕزگاری بوو ئەو کەسەی کە موسڵمان بووەو بەشی خۆی ڕۆزی پێدراوەو قنیاتبێ بەوەی کە خوا پێیداوە} ئینجا پاش ئەوەی کە ئەم سێ نیعمەتە گەورەی باسکرد بۆ پێغەمبەرمان ﷺ و خستیە بەرچاوی، خوای داناو میهرەبان داوا لە پێغەمبەرمان دەکاتو دەفەرموێ:

(٩) جا کەوابو تۆیش لەبیری هەتیواندا ببەو قسەی توندو تیژیان پێ مەڵێ.

ئەبوهورەیرە دەڵێت پیاوێك لە دڵڕەقی خۆی شکاتی بردەلای پێغەمبەرﷺ جا پێغەمبەرﷺ پێی فەرمو: {إِنْ أَرَدْتَ تَلْيِينَ قَلْبِكَ فَأَطْعِمْ الْمِسْكِينَ وَامْسَحْ رَأْسَ الْيَتِيمِ/أحمد، حسنه الألباني/ گەر دەتەوێت دڵت نەرم بێت، دەی خوراك بە هەژار بدەو دەست بەسەر هەتیودا بهێنە}

وە داواکاران چ بۆ زانینو چ بۆ سامان کە دێنەلات ڕویان لێ گرژمەکەو بە قسەی ناشیرینو توند وەڵامیان مەدەوە.

(١١) سا تۆ باسی نیعمەتەکانی پەروەردگاری خۆت بکە، واتە پێویستە لەسەرت کە نیعمەتەکانی پەروەردگارت باس بکەیت بۆ خەڵك چ نیعمەتی پێغەمبەرایەتی بێتو چ نیعمەتی یارمەتی خوا بێت بۆ ئەنجامدانی ئیشی چاك تا خەڵك چاوی لێ بکاتو پەیڕەوی بکات، وەچ نیعمەتی پاراستنو فێرکردنو بارهێنانی ﷲ بێت بۆی هەر لە منداڵیەوە تا ئەو کاتەی کەلەدنیاداکۆچی کردوە. یەك لە نزاکانی پێغەمبەرﷺ ئەمە بو کە دەیفەرمو: {وَاجْعَلْنَا شَاكِرِينَ لِنِعْمَتِكَ مُثْنِينَ بِهَا قَابِلِيهَا وَأَتِمَّهَا عَلَيْنَا/ابوداود،صححه الألباني / ئەی پەروەردگارم وامان لێبکە کە شوکری نیعمەتەکانت بکەینو بەچاکە باسیان بکەین و پێشوازی لەو نیعمەتانەت بکەینو بەکەمی نەزانین جا ئەی پەروەردگارم نیعمەتەکانت لەسەرمان تەواو بکە.}

## سورەتی شەرح ٨ ٩٤

سورەتی شەرح کەبە سورەتی ﴿أَلَمْ نَشْرَحْ﴾ یان سورەتی (الإنشراح)یش ناوبراوە، نەوە نەوەدو چوارەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، هەشت ئایەتەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین دوانزە هەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الضحى)و پێش (العصر) دابەزیوە.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئایا ئێمە دڵی تۆمان فرەوان نەکردو ڕوناکمان نەکردوە؟

هەندێك وتویانە مەبەست دڵ لەتکردنی پێغەمبەرە ﷺ لەکاتی بەرزکردنەوەی بۆ ئاسمان، کە واتە ئەم سورەتە پاش (میعراج) هاتوتە خوارەوە، لە فەرمودەیەکدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {بَيْنَمَا أَنَا عِنْدَ الْبَيْتِ بَيْنَ النَّائِمِ وَالْيَقْظَانِ إِذْ سَمِعْتُ قَائِلًا يَقُولُ أَحَدٌ بَيْنَ الثَّلَاثَةِ فَأُتِيتُ بِطَسْتٍ مِنْ ذَهَبٍ فِيهَا مَاءُ زَمْزَمَ فَشَرَحَ صَدْرِي إِلَى كَذَا وَكَذَا قَالَ قَتَادَةُ قُلْتُ لِأَنَسِ بْنِ مَالِكٍ مَا يَعْنِي قَالَ إِلَى أَسْفَلِ بَطْنِي فَاسْتُخْرِجَ قَلْبِي فَغُسِلَ قَلْبِي بِمَاءِ زَمْزَمَ ثُمَّ أُعِيدَ مَكَانَهُ ثُمَّ حُشِيَ إِيمَانًا وَحِكْمَةً / الترمذي،صححه الألباني/ لەکاتێکدا کە من لەلای بەیتدا لەنێوان خەو وبێداریدا بوم لەوکاتەدا بیستم یەکێك وتی: یەکێکە لەنێوان ئەوسیانەدا جاتەشێکی زێڕم بۆهێنرا کەئاوی زەمزەمی تێدابو، جا سینگم لەوێ تا ئەوێی لەتکرا، قەتادە وتی: وتم بەئەنەس مەبەستی کامەیە؟ وتی: هەتا خواری سکی، ئەوسادڵم دەرهێنرا، ئینجا دڵم بەئاوی زەمزەم شۆرا، پاشان خراوە جێگای خۆی پاشان پڕ کرا لەباوەڕو دانایی}

وە لە ڕیوایەتێکی تردا کە ئیمامی ئەحمەد لە ئەبوهورەیرەوە دەگێڕێتەوە : وا دەگەیەنێت کە لە تەمەنی دە ساڵیو چەند مانگیدا جارێك دڵی لەتکراوەو دڵی پاك کراوەتەوەو سۆزو بەزەیی تێدا دانراوە، وە هەندێك لەسیرەت نوسانیش دەڵێن: پاش دوو ساڵ لەلای حەلیمەی سەعدیە کاتێك لەگەڵ برا شیریەکەیدا لەلای گێزگەل بو دڵی لەتکراوە، لەڕاستیدا مانای یەکەم هەمویان دەگرێتەوە، واتە لەشو دڵی پاك کراوەتەوەو بێجگە لە ئاسودەییو ڕزگاربونی خەڵك لە ناخۆشیو سزاو ڕەزامەندی خوا مەبەستێکی تری لە دڵدا نەبوە هەر بۆیە بە کەمترین ماوە گەورەترین سەرکەوتنی بەدەست هێنا. ئینجا دەفەرموێ:

(٢) جا لامان برد لەسەر تۆ باری گرانت.

(٣) ئەو بارەی کە ئەوەندەقورسو گرانبو پشتی چەماندبویتەوە، ئەوەبو ئەو زاتە بەنرخە ئەو ڕێبازەی گەلەکەی بەلاوە شتێکی پوچو نەزانانەبو، جا هەمیشە بیری لەوە دەکردەوە کە چارەسەرییەکی بۆ بدۆزێتەوەو زۆر دلگرانو خەفەتباربو لەو بارودۆخەی کە تێیدا دەژیان تا ﷲ نیگای (وەحی) کردە لای و ڕێگای چارەسەری تێگەیاندو ئەو بارە سەختەی سەرشانی لابردو چاوپۆشی لە هەمو تاوانێکی کرد وەکو لە سورەتی فەتح دا دەفەرموێ:﴿خوا ئەوەی بۆکردیت تالە تاوانی رابردوو وئایندەت خۆش ببێتو نیعمەتی خۆی تەواو بکات بەسەرتاو بۆرێگای ڕاستت ڕێنمایی بکات﴾ ئینجا دەفەرموێ:

(٤) جا ئایا ناوی تۆمان بەرزنەکردوە؟ ئەو مرۆڤە نەخوێندەوارو هەتیوە لەو دورگە وشكو کەم سامانەدا ﷲ ناوی ناساند بە هەمو جیهان بۆهەتا هەتایە، وە باوەڕ بەﷲ یش لە کەس وەرناگیرێت تا نەڵێت باوەڕم هەیە بە محمد ﷺ کە پێغەمبەری خوایە (أَشْهَدُ أن لا إلَه إلّا الله وَأنَ مُحَمد رَسُولُ الله) لای

کەم ڕۆژانە لە هەمو شارو دێهاتێکدا دە جار ئەم ڕستە بەنرخە بە دەنگێکی بەرز دەوترێتەوە، ئینجا دەفەرموێ:

(٥) جا کەوابو بۆت دەرکەوت کە لەگەڵ هەمو نارەحەتیو تەنگانەیەکدا خۆشیو ئاسانی هەیە تۆی بێ باوكو نەخوێنندەوارو دڵ تەنگ بەحاڵی گەلەکەت، دیت کە الله جێگای کردیتەوەو دڵی فرەوان کردیتو تێیگەیاندیت کە چۆن ئەو گەلەت ڕزگاربکەیت، واتە : دوای ئەو سەختیو نارەحەتیانە تۆی خستە خۆشیەوە، جا ئەم جۆرە باوەی ئێمە (هێنانی خۆشیو فەرەحی لەگەڵ ناخۆشیو تەنگانەدا) بڕیارێکی هەمیشەییە، بۆیە دوبارە دەفەرموێ:

(٦) بەڕاستی لەگەڵ هەمو نارەحەتیو تەنگانەیەکدا خۆشیو فەرەحی هەیە کە هەردووکیان هۆی تاقیکردنەوەی بەندەکانی خوایەو خۆشیو فەرەحی ماوەکەی زیاترە لە کاتی ناخۆشیو تەنگانە، چونکە وشەی (العسر) بە مەعریفەی ناوبردوە واتە: ئەو سەختیەی لەبەرچاوە مانای تاك دەگەیەنێتو وشەی (یسر) نەکیرەیەو بۆ زۆر بەکاردێت، یانی ئەمە بەرنامەیەکە کە تەواوی نارەحەتیەکان چەندین خۆشیو فەرەحیان لەگەڵدایە، بەهەر حاڵ هەرچۆن ببێت مرۆڤ زۆرتر لە خۆشیو فەرەحیدایەو کەمتر لە سەختیو تەنگانەدایەو لەم بارەوە وتراوە: ( لَن يَغلِب عسرٌ يُسرين، لَن يَغلب عسر يسرين/ هەرگیز زاڵ نابێت نارەحەتیەك بەسەر دوو خۆشیدا هەرگیز زاڵ نابێت نارەحەتیەك بەسەر دوو خۆشیدا). ئینجا دەفەرموێ:

(٧) جا هەر کاتێك لێ بویتەوە لە کاروباری دنیاتو دڵت ئاسودە بو، جا ئەو کاتە خۆت ماندوبکە بە یادی پەروەردگارتو خەریکی بەندایەتییە واتە: لە چاکەیەك بویتەوە خەریکی چاکەیەکی تربە و کاتەکانی تەمەنت بە بێسود لەدەست مەدە، بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ ڕانەدەکشا بۆ ئەوەی بخەوێت بەڵکو خەوی دەهات بۆیە ڕادەکشا، وە دەفەرموێ: {نِعمَتَانِ مَغبُونٌ فِيها كَثِير مِن النّاس، اِلصِحَةُ وَالفَرَاغ/البخاری/ دوو نیعمەت هەن زۆربەی خەڵك زیانی تێدا دەکەن، لەش ساقیو بێ ئیشی} بەڵێ بەندایەتی خواو ئیشی چاکە مەرجێکی گرنگی هەیە تا ئەو مەرجەی تێدا نەیەتەدی کابرا کە خۆی خەریك دەکات تەنها ماندوبونی بۆ دەمێنێتەوە، ئەویش پاڵفتەکردنی نیەتە بۆ خواو ڕاستکردنە لەگەڵ ئەو پەروەردگارە بەئاگاو دانایەدا بۆیە دەفەرموێ:

(٨) ئەوسا تەنها پەروەردگاری خۆت بکە بەجێگای ئومێدو تەنها مەبەستت ئەو بێتو کەسی تر نەکەیت بە جێگای ڕازو نیازی خۆتو هەر ئەوە ڕزاونیازەکانت بۆ بەراورد دەکات. بەڵێ بەڕاستی هەر کەسێك پشت ببەستێت بەالله ئەوسا ئەو زاتە بەسە بۆی.

٩٥ سُورَةُ التِّينِ ٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلتِّينِ وَٱلزَّيۡتُونِ (١) وَطُورِ سِينِينَ (٢) وَهَٰذَا ٱلۡبَلَدِ ٱلۡأَمِينِ (٣) لَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ فِيٓ أَحۡسَنِ تَقۡوِيمٖ (٤) ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ (٥) إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَلَهُمۡ أَجۡرٌ غَيۡرُ مَمۡنُونٖ (٦) فَمَا يُكَذِّبُكَ بَعۡدُ بِٱلدِّينِ (٧) أَلَيۡسَ ٱللَّهُ بِأَحۡكَمِ ٱلۡحَٰكِمِينَ (٨)

٩٦ سُورَةُ العَلَقِ ١٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ مِنۡ عَلَقٍ (٢) ٱقۡرَأۡ وَرَبُّكَ ٱلۡأَكۡرَمُ (٣) ٱلَّذِي عَلَّمَ بِٱلۡقَلَمِ (٤) عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ (٥) كَلَّآ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَيَطۡغَىٰٓ (٦) أَن رَّءَاهُ ٱسۡتَغۡنَىٰٓ (٧) إِنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ ٱلرُّجۡعَىٰٓ (٨) أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يَنۡهَىٰ (٩) عَبۡدًا إِذَا صَلَّىٰٓ (١٠) أَرَءَيۡتَ إِن كَانَ عَلَى ٱلۡهُدَىٰٓ (١١) أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ (١٢) أَرَءَيۡتَ إِن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰٓ (١٣) أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ (١٤) كَلَّا لَئِن لَّمۡ يَنتَهِ لَنَسۡفَعَۢا بِٱلنَّاصِيَةِ (١٥) نَاصِيَةٖ كَٰذِبَةٍ خَاطِئَةٖ (١٦) فَلۡيَدۡعُ نَادِيَهُۥ (١٧) سَنَدۡعُ ٱلزَّبَانِيَةَ (١٨) كَلَّا لَا تُطِعۡهُ وَٱسۡجُدۡۤ وَٱقۡتَرِب ۩ (١٩)

## ٩٥ سورەتی تین ٨

سورەتی تین کە بە سورەتی ﴿وَٱلتِّينِ﴾ یش ناوبراوە، نەوەدو پێنجەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، هەشت ئایەتە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین بیستو هەشت هەمین سورەتە کە پاش سورەتی (البروج)و پێش (قريش) دابەزیوە.

بەناوی الله ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە هەنجیر، سوێند بە زەیتونیش. دەگونجێت مەبەست هەر ئەو درەختە ناسراوانە بن کە بەرەکانیان گەلێك سودی تێدایە بۆ مرۆڤ ، دەشگونجێت ئەو دوو شوێنەبێت کە عیسای تێداکراوە بە پێغەمبەر (محلة التين والزيتون/ گەڕەکی تینوزەیتون).

(٢) سوێند بە چیای سەینایش، ئەو چیایە کە خوا قسەی لەگەڵ موسادا کرد.

(٣) سوێند بەو شارە ئەمنو ئاسایشە کە مەکەیەو ماڵی خوای تێدایەو پێغەمبەرمانی ﷺ تێداکراوە بە پێغەمبەر، سوێند بەو چوار شتە گرنگو پڕ مانایە

(٤) بەبێگومان ئێمە مرۆڤمان دروستکردوە لە جوانترین شێوەو دیمەندا.

(٥) لەپاشان هێناومانەتەوە بۆ پلەیەکی نزمتر لە هەمو نزمەکانو خراپو پەستتر لە هەمو خراپو پەستەکان. واتە : پاش ئەو دیمەنە جوانو شیرینەو پاش ئەو بەژنو باڵا ڕێکوپێکە، ئەگەر بەندایەتی خوای نەکرد دەیکەن بەو مرۆڤە ناشیرینە کە تەنها دانێکی بە ئەندازەی چیایەك دەبێتو پێستی لەشی حەفتا مەتر ئەستور دەبێتو لەناو ئاگردا یاری پێدەکرێتو لە کاتژمێرێکدا سەدوبیست جار ئەو پێستەی دەتوێتەوەو دووبارە بۆی دروست دەکرێتەوە، تا سزای زیاتر بچەژێتو سەرشۆڕو داماوو گاڵتە پێکراو بێت

(٦) بێجگە لەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو ئیشی چاکیان ئەنجامداوە، ئەوانە نەوەك دوچاری ئەو ژیانە پەستو تاڵو ناخۆشە نابن، بەڵکو بۆ ئەوان هەیە پاداشتێکی هەرگیز نەبڕاوە. ئینجا دەفەرموێ:

(٧) دەی ئیتر دەبێت چ شتێك بێت دوای ئەم هەمو بەڵگە ڕۆشنو بەهێزانە لەسەر دەسەڵاتو هێزی اللّٰه وابکات لە تۆ ئەی مرۆڤ کە باوەڕت بە ڕۆژی قیامەت نەبێتو زیندوکردنەوەت بەلاوە دووربێت؟

(٨) ئایا اللّٰه لە هەمو دادپەروەرانو دەسەڵاتداران دادپەروەرو دەسەڵاتدارتر نیە؟ ئاشکرایە وەڵامی بەویژدانو خواناسان ئەوەیە کە دەڵێن: بەڵێ، دەی چونکە خوا دادپەروەرە دەبێت قیامەتو زیندوکردنەوە هەبێت تا خوا مافی هەمو مافخوراوانو پاداشتی هەمو پیاوچاکانو تۆڵە لە هەمو ستەمکاران وەرگرێت، جا باش وایە ئەو کەسەی ئەم ئایەتە دەخوێنێت یان گوێی لێبێت بخوێنرێت بڵێ: (بَلَى وَأَنَا عَلَى ذَٰلِكَ مِنَ الشَّاهِدِينَ/ بەڵێ خوا لە هەمو دادپەروەرانو دەسەڵاتداران دادپەروەرترو دەسەڵاتدارترەو من لەسەر ئەوە شایەتی دەدەم).

## ٩٦ سورەتی عەلەق ١٩

سورەتی عەلەق کە نەوەدوشەشەمین سورەتی قورئانە، یەکەم سورەتە کە لە ئەشکەوتی حیرا لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەرمان ﷺ و نۆزدە ئایەتە.

خێزانە بەڕێزو زاناکەی پێغەمبەرمان ﷺ خاتون عائیشە (خوا لێی ڕازی بێت) دەڵێت: یەکەم شتێك کە لەبارەی وەحیەوە هاتوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو خەوە ڕاستانە بو کە لە خەودا دەیبینیو هیچ خەوێکی نەدەبینی مەگەر ئەو خەوە وەکو خۆی بهاتایەدی، لە پاشان تەنهایی بەلاوە خۆشتربو لەبەرئەوە هەمیشە دەچوە ئەشکەوتی حیراو خەریکی بەندایەتی اللّٰه بو جا بۆ چەند شەوێك تویشوی دەبرد لەگەڵ خۆیداو هەر کاتێك توێشوەکەی دوایی دەهات دەهاتەوە ماڵەوە بۆلای خەدیجەو دیسان توێشوی بۆ ئامادەدەکردو دەگەڕایەوە ئەو ئەشکەوتەو هەتا تەمەنی گەیشتە چل ساڵ، شەوێك فریشتەیەك هاتەلای و وتی: بخوێنە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: منیش وتم : من خوێندەوار نیم، ئینجا دەفەرموێ: گرتمیو گوشیمی بەخۆیەوە هەتا زۆر ناڕەحەت بوم لەپاشان وازی لێهێنامو وتی: بخوێنە، وتم: من خوێندەوار نیم هەم گوشیمی بەخۆیەوەو ئێشم پێگەیشت لەپاشان وازی لێهێنامو وتی: بخوێنە، منیش وتم: خوێندەوار نیم، جا جاری سێهەم توند گوشیمی بەخۆیەوە تا زۆر ناڕەحەت بوم لەپاشان بەرەڵای کردمو وتی: ﴿ٱقۡرَأۡ بِٱسۡمِ رَبِّكَ ٱلَّذِي خَلَقَ﴾هەتا گەیشتە ﴿عَلَّمَ ٱلۡإِنسَٰنَ مَا لَمۡ يَعۡلَمۡ﴾.

عائیشە وتی: بەو چەند ئایەتەوە گەڕایەوە کە دەماری ملی بەتوندی لێی دەدا تا هاتەوە لای خەدیجەو فەرموی: (زمِّلُونی، زمِّلُونی/ دامپۆشن دامپۆشن)،

جا دایان پۆشی هەتا ئەو ترسو سامە لە دڵی دەرچو، ئینجافەرموی: ئەی خەدیجە چی بوو ڕویدا؟ جا هەواڵەکەی بۆ باسکردو فەرموی: من لەخۆم دەترسم، خەدیجەیش (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: نەخێر مەترسە، بەڵکو موژدە بدە، بەاللّٰه هەرگیز اللّٰه تۆ شەرمەندە ناکات، چونکە تۆ پەیوەندی خزماتیەتی دەپارێزیو قسەت ڕاستەو بۆ خۆت خۆت زەحمەت دەدەیتوەهەر وەها ڕێزی میوان دەگریت، وە تۆ یارمەتی لێقەوماوان دەدیت لەپاشان خەدیجە لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺچونە لای وەرقەی کوڕی نەوفەل کە ئامۆزای خەدیجەبو، چوبوە سەر ئایینی عیسا (علیه سلام) و نوسینی عەرەبی دەزانیو گەلێك نوسخەی ئینجیلی بە عەرەبی نوسیبویەوەو بەساڵدا چوبو هەردوو چاوی لەدەستدا بو، جا خەدیجە (خوا لێی ڕازی بێت) وتی: ئەی کوڕی مامم گوێ بگرە لە برازاکەت وەرەقەیش وتی: ئەی برازام چیت بینیوە؟ ئەویش ڕوداوەکەی بۆ باسکرد، وەرەقەیش وتی: ئەوە ئەو فریشتەیە کە هاتوەتە لای موسا، ئای خۆزگە من لە سەردەمی ئەم پێغەمبەرایەتیەدا گەنج بومایەو بمتوانیایە کاتێك کە ئەم گەلەت دەرتدەکەن یارمەتیم بدایتایە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی:{ ئایا دەرم دەکەن؟} وەرەقە وتی: بەڵێ، هیچ پیاوێك بە ئەو فەرمانەی کە بەسەر تۆدا دراوە نەهاتوە مەگەر دوژمنایەتی لەگەڵدا کرابێت، خۆ ئەگەر من بەو ڕۆژەی تۆ بگەم یارمەتیەکی چاکت دەدەم، زۆری نەبرد وەرەقە وەفاتی کردو وەحیش بچڕاو پێغەمبەری خوا ﷺ

زۆر خەفەتی دەخواردو زۆر نارەحەت بو، هەتا خەریکبو خۆی لە چیا هەڵدات، بەڵام هەر کاتێك بەو حاڵ وبارە دەگەیشت، جبرەئیل خۆی پیشان دەداو دەیوت: بەڕاستی تۆ پێغەمبەری خوایت، جا بەو هۆیەوە ئارامی دەگرتو دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، دەڵێن چەند جارێك لەو ماوەدا ئەم شتە دووبارەبوەتەوە بۆیان، ئینجا دەچینە سەر مانای سورەتەکە.

بەناوی اللهی زۆربەسۆزو بنیهایەت میهرەبان

(١) بخوێنە بەناوی پەروەردگارتەوە ئەوەی کە دروستی کردوە، لێرەدا دروستکردنی فەرموە بێ ئەوەی ناوی دروستکراوەکان ببات تا هەروا بەو مانا گشتیە بمێنێتەوە، ئەگینا ئەگەر تەنها هەر ناوی دروستکراوەکانی بفەرموایە بە چەندین ئەوەندەی قورئان تەواو نەدەبو، جا الله لە ناو ئەو هەمو دروستکراوانەدا باسی دروستکردنی مرۆڤـ دەکات بەشێوەیەکی کورتو دەفەرموێ:

(٢) مرۆڤی دروستکردوە لە پارچە گۆشتێکی ڕەشی درێژ وەکو زالو(زەرو)، دیارە لە شوێنەکانی تردا بە درێژی باسی ئەم دروستکردنەی کردوە بە تایبەت لە ئایەتەکانی سەرەتای سورەتی (المؤمنون)داو پێویست ناکات لێرەدا دووبارەی بکەینەوە، بەڵام ئەوەی جێگای قسەیە ئەوەیە کە لێرەدا باسی دروستبونی مرۆڤ دەکات لەو کاتەی کە لە شێوەی زالودا بوە، چونکە لەپاشان باسی خوێندنو نوسین دەکات بۆ مرۆڤ: واتە تۆ ئەو شتە بێنرخو بێدەستو پێ و بێ چاوو گوێ بوی، کەچی ئێمە ئەو هەمو شتە بەنرخانەمان دا بەتۆو تۆ ئێستا دەتوانی داناو زاناو ژیربیتو کراوی بە سەرپشك بۆ هەڵبژاردنی ڕێگای چاكو خراپو توانای ئەوەت پێدراوە کە چاكو خراپ لەیەك جیابکەیتەوە، دەی بەمە لەخۆ بایی مەبە، تەماشای ئەو کاتەت بکە کە تۆ وەکو کرمێکی ڕەش بێهۆشو گۆش بویت الله ئەو لوتفە گەورەیەی لەگەڵ تۆدا کردو کردیتی بەم مرۆڤە ژیرو زانایە بەهۆی خوێندنو قەڵەمەوە وەك دەفەرموێ:

(٣) بخوێنە، خۆ پەروەردگاری تۆ زۆر بەڕێزەو خاوەن بەخششە.

(٤) ئەو زاتەی کە مرۆڤی فێری زانیاری کرد بەهۆی قەڵەمەوە، بەڵێ ئەگەر نوسینو قەڵەم نەبوایە مرۆڤ بەو پلە بەرزەی زانایی نەدەگەیشت مەگەرتەنها ئەو کەسەی کە الله بەتایبەت ڕێنمایی بکردایەو خۆی فێری بکردایە کە پێغەمبەرمان ﷺ نمونەی هەرە بەرزو گرنگو روونی ئەو جۆرە فێرکردنەیە واتە: وشەی (علم بالقلم) گشتیەو تایبەتکراوە (عام مخصوص) بەپێغەمبەرمان ﷺ تەنانەت ماوەی پێنەدراوە کە شت بنوسێت یان لە ڕوی کاغەز شت بخوێنێتەوە وەك لە سورەتی عەنکەبوت: ٤٨)دا دەفەرموێ:﴿تۆلەپێش ئەوقورئانەدا هیچ پەڕاوێکت نەخویندوەتەوەو بەدەستی راستت هیچ شتێکت نەنوسیوە ئەگەر ئەوەت لەپێشدا ببوایە ناحەقان دەکەوتنە گومانەوە﴾، ئینجا دەفەرموێ:

(٥) مرۆڤی فێری شتی وا کردوە کە خۆی هیچی لێ نەدەزانی.

(٦) نەخێر وانیە، مرۆڤ زوو چاکەی لەبیردەچێتەوە، ناسوپاسە بەڕاستی مرۆڤ لەخۆی بایی دەبێتو لوت بەرزی دەکاتو هیچ نرخێك بۆ مرۆڤی خواروی خۆی دانانێت.

(٧) کاتێك کە خۆی بینی بێنیازەو خاوەن دەسەڵاتو ماڵو سامانە.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:{ مَنْهُومَانِ لاَ يَشْبَعَانِ مَنْهُومٌ فِي الْعِلْمِ لاَ يَشْبَعُ مِنْهُ وَمَنْهُومٌ فِي الدُّنْيَا لاَ يَشْبَعُ مِنْهَا/ مشكاة.صححه الالباني/ دووچڵێس هەن کەتێر نابن، چڵێسێك لەبارەی زانینەوە کە تێر نابێت لێی،وە چڵێسێکی کەش کە لەبارەی دنیاوە تێر نابێت لێی} لەراستیدا یەکەمیان چاکەومەترسی کەمە، دووهەمیان زۆر لەمەترسیدایە، چونکە دنیا زۆر زوو مرۆڤ فریو دەدات،چونکە مرۆڤ لەناخی خۆیدا وایە کەزوو لەخۆی بایی دەبێت، کاتێك کە خۆی بینی بێنیازەو خاوەن دەسەڵاتو ماڵو سامانە. جا پەروەردگاری داناو میهرەبان بەزەیی بەو مرۆڤە سەرکەشەدا دێتەوەو لە پاشەڕۆژ دەیترسێنێت بەڵکو بیربکاتەوەو پاشەڕۆژی خۆی خراپ نەکاتو دەفەرموێ:

(٨) بەڕاستی تەنها بۆلای پەروەردگاری تۆیە گەڕاندنەوە هەرچۆن ببیو هەرچی بکەیتو هەر چیت هەبێت هەردەبێ بگەڕێیتەوە بەردەم دادگای خواو پاداشتو تۆڵەی کردارەکانی خۆت وەرگریت، جا هەر لە پێڕی ئەو جۆرە مرۆڤە ناسوپاسانەدا کەسانێك هەن کە ڕێگای خواپەرستیو بەندایەتیش لە خەڵك دەگرنو دەبنە کۆسپ لە ڕێگای بڵاوکردنەوەی ئایینی خواداو دۆستانی خوا ئازاردەدەن وەك دەفەرموێ:

(٩) ئایا دیت ئەو کەسەی کە بەرگری دەکات،

(١٠) لەبەندەیەکی الله ئەو کاتەی کە نوێژی دەکات، واتە بۆچی دەبێت ئەوەندە تاوانبارو ستەمکارو نەفام بێت زیاتر هەڕەشەی لێ دەکاتو دەفەرموێ:

(١١) دەی پێم بڵێ ئەو بەندە لەسەر ڕێگای ڕاست بێتو کاری ڕاست ئەنجام بدات،

(١٢) یان فەرمان بدات بە پارێزکاریو لەخواترسان، تۆ ئەی ستەمکاری نەفام هەڕەشەی لێدەکەیتو ڕێگای بەندایەتی لێدەگریت؟!

(١٣) پێم بڵێ ئەگەر ئەو بێباوەڕ بوایەو پشتی بکردایە ئایین تۆ ئاوەها لەگەڵیدا دەجوڵایتەوە؟ ئاشکرایە ئەگەر لەو مرۆڤە بێباوەڕو خوانەناسان بوایە ئەو ئێشو ئازارەی بۆ دروست نەدەکرد، بۆیە ﷲ زیاتر هەڕەشەی لێدەکاتو دەفەرموێ:

(١٤) ئایا نازانێت کە خوا چاوی لێیەتیو ئاگای لە هەموو هەڵسوکەوتێکی هەیەو دەزانێت دژمنانی چی لەگەڵ دۆستانی دەکەن واتە: بۆ کوێ دەچنو چی دەکەن، هەر دەبێت بگەڕێنەوە بۆ لای ئێمەو ئێمەیش چاومان لێیەتی چی دەکەن. بۆیە دەفەرموێ:

(١٥) نەکەن شتی ئاوەهاو بگەڕێنەوەو تەوبەی لێ بکەن بەڕاستی ئەگەر واز لەو خراپەکاریو تاوانە نەهێنێت با دڵنیابێت کەبەتوندی لەناوچاوانی دەدەنو بەرەو دۆزەخ ڕایدەکێشن، کام ناوچاوان؟

(١٦) ناوچاوێکی درۆزنی تاوانبار.

(١٧) جا با ئەو بانگ بکاتە یارو دۆستو هاونیشەکانی، چی دەتوانێت با بیکات بێ منەت بێت.

(١٨) بەم زوانە ئێمەیش بانگ دەکەینە دەرگاوانی دۆزەخ بۆی، جا ئەو کاتە دەزانێت کاممان بەهێزین.

ئیبنو عەباس دەڵێت: جارێکیان پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای مەقامدا (جێگای ئیبراهیم) نوێژی دەکردو ئەبوجەهل بەلایدا تێپەڕیو وتی: ئەی محمد مەگەر من پێم نەوتیت نەیەیتە ئەم جێگایە، پێغەمبەری خوا ﷺ بەتوندی وەڵامی دایەوەو هەڕەشەی لێکرد، جا ئەویش وتی: ئەی محمد تۆ بەچی هەڕەشەم لێدەکەیت؟ ئاگاداربە من لە هەموو خەڵکی ئەو شیوە هاوڕێو هاونیشم زۆرترە!

ئینجا ﷲ ئەم ئایەتەی ناردەخوارەوە ﴿دەی با بانگ بکاتە هاونیشانانی خۆی. ئێمەش بانگ دەکەینە دەرگاوانی دۆزەخ بۆی﴾،

ئیبنو عەباس وتی: ئەگەر بانگی بکردایە هاونیشەکانی بەڕاستی فریشتەکانی سزا هەر لەو کاتەدا بەسەریاندا دەداو لەناویان دەبرد. ئینجا ﷲ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ:

(١٩) نەکەیو بەگوێی نەکەیت لە بەندایەتی ﷲداو پاشەکشە نەکەیت، جا لە هەر شوێنێکیشدا دەتەوێت نوێژ بکەو مەترسە لێی، خوا یارمەتیدەرو پارێزگارتە، نوێژبکەو لە خواوە خۆت نزیك بکەرەوە،

مەبەست لە وشەی (سوجدە) نوێژە، بەڵام بەناو بەشێکیەوە نابراوە کە زۆر گرنگەو کاتی زۆر نزیکبوونەوەی بەندەیە لە ﷲوە، واتە دژمنان دەیانەوێ تۆ لە خواپەرستی دووربخەنەوە، جا تۆ زیاتر خۆت نزیك بکەرەوە، هەر لەم بارەوە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {أَقْرَبُ مَا يَكُونُ الْعَبْدُ مِنْ رَبِّهِ وَهُوَ سَاجِدٌ فَأَكْثِرُوا الدُّعَاءَ/مسلم/ نزیکترین کاتی بەندە لە پەروەردگاری خۆیەوە ئەو کاتەیە کە لە سوجدەدایە دەی پاڕانەوەی زۆر بکەن لەو کاتەدا} سوننەتە پاش خوێندنی ئەم ئایەتە سوجدە ببرێت وەکو لە سەرەتای سورەتی (الانشقاق)دا باسمان کرد، جابەچاکی دەزانم لێرەدا ژمارەی سوجدەکانی قورئانو سورەتەکانیو شوێنی سوجدە بردنەکان باس بکەم تائیتر پێویست نەکات بەباس کردنیان، لەپانزە جێگای قورئاندا سوجدەبردن سونەتە، ئەمەش جێگاکانیەتی لەگەڵ ناوی سورەتەکەدا: {عَنْ إبن مسعود أَنَّ النَّبِي ﷺ قَرَأَ (وَالنَجم) فَسَجَدَ فِيهَا، وسَجَدَ مَنْ كَانَ مَعَهُ غَيْرَ أَنَّ شَيْخاً مِنْ قُرَيشْ أَخَذَ كَفاً مِنْ حَصَى، أَوْ تُرابِ فَرَفَعَهُ إلى جَبْهَتِهُ، وَقَالَ: يَكْفِنِي هَذَا، قَالَ عَبْدالله: فَلَقَدْ رَأَيْتُهُ بَعْدُ قُتِلَ كَافراً/ متفق عليه }

لە عەبدوڵای کوڕی مەسعودەوە ﷺ هاتوە، کە پێغەمبەر ﷺ سورتی (النجم)ی خوێندەوە، لە کۆتاییەوە سوجدەی بردوە، هەر کەسێکی لەگەڵ دابو سوجدەی برد بێجگە لە پیرێکی قورەیش، کە پڕ مشتێ وردە بەرد یان خۆڵی هەڵگرتو بردیەوە لای ناوچاوانیو وتی: ئەوەندە بەسە بۆ من، عەبدوڵا وتی: بەڕاستی ئەو کابرایەم دی لە پاشدا بەکافری کوژرا} .

بەڵێ (١٥) شوێن هەیە لە قورئان دا سوننەتە سوجدەیان تێدا ببردرێت.

١ـ کۆتایی سورەتی(الأعراف) لەکاتی خوێندنی( وَٱذۡكُر رَّبَّكَ فِي نَفۡسِكَ تَضَرُّعٗا وَخِيفَةٗ وَدُونَ ٱلۡجَهۡرِ مِنَ ٱلۡقَوۡلِ بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ وَلَا تَكُن

مِنَ ٱلۡغَٰفِلِينَ ﴿٢٠٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِهِۦ وَيُسَبِّحُونَهُۥ وَلَهُۥ يَسۡجُدُونَ۩ ﴿٢٠٦﴾ ).

٢ـ لە ئایەتی پانزەی سورەتی(الرعد) لە کاتی خوێندنی(وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَظِلَٰلُهُم بِٱلۡغُدُوِّ وَٱلۡأٓصَالِ ۩ ﴿١٥﴾ )

٣ـ لەسورەتی (النحل) لەکاتی خوێندنی( وَلِلَّهِ يَسۡجُدُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ مِن دَآبَّةٖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوۡقِهِمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٥٠﴾ ).

٤ـ لە سورەتی (الإسراء) لە کاتی خوێندنی (إِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ يَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ يَبۡكُونَ وَيَزِيدُهُمۡ خُشُوعٗا ﴿١٠٩﴾ ).

٥ـ لە سورەتی (مريم) لە کاتی خوێندنی (إِذَا تُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُ ٱلرَّحۡمَٰنِ خَرُّواْ سُجَّدٗا وَبُكِيّٗا ).

٦ـ لە سورەتی (الحج) لە کاتی خوێندنی ( أَلَمۡ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ يَسۡجُدُ لَهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُ وَٱلنُّجُومُ وَٱلۡجِبَالُ وَٱلشَّجَرُ وَٱلدَّوَآبُّ وَكَثِيرٞ مِّنَ ٱلنَّاسِۖ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيۡهِ ٱلۡعَذَابُۗ وَمَن يُهِنِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِن مُّكۡرِمٍۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَفۡعَلُ مَا يَشَآءُ ) ١٨.

٧ـ لەسورەتی (الحج) لە کاتی خوێندنی (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٧٧﴾ ).

٨ ـ لە ئایەتی شەستی سورەتی (الفرقان) لە کاتی خوێندنی ( وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ أَنَسۡجُدُ لِمَا تَأۡمُرُنَا وَزَادَهُمۡ نُفُورٗا ).

٩ـ لە سورەتی (النمل) لە کاتی خوێندنی (أَلَّا يَسۡجُدُواْ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخۡرِجُ ٱلۡخَبۡءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَيَعۡلَمُ مَا تُخۡفُونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلۡعَرۡشِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٦﴾ ) ٢٦.

١٠ـ لە سورەتی (السجدە) یان (الم تنزيل) لە کاتی خوێندنی ( إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدٗا وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ ).

١١ـ لە سورەتی (ص) لە کاتی خوێندنی (قَالَ لَقَدۡ ظَلَمَكَ بِسُؤَالِ نَعۡجَتِكَ إِلَىٰ نِعَاجِهِۦۖ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلۡخُلَطَآءِ لَيَبۡغِي بَعۡضُهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَقَلِيلٞ مَّا هُمۡۗ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسۡتَغۡفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّۤ رَاكِعٗا وَأَنَابَ ۩ ﴿٢٤﴾ ).

١٢ـ لە سورەتی (حم السجدة) لە کاتی خوێندنی (وَمِنۡ ءَايَٰتِهِ ٱلَّيۡلُ وَٱلنَّهَارُ وَٱلشَّمۡسُ وَٱلۡقَمَرُۚ لَا تَسۡجُدُواْ لِلشَّمۡسِ وَلَا لِلۡقَمَرِ وَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ ٱلَّذِي خَلَقَهُنَّ إِن كُنتُمۡ إِيَّاهُ تَعۡبُدُونَ ﴿٣٧﴾ (یان) فَإِنِ ٱسۡتَكۡبَرُواْ فَٱلَّذِينَ عِندَ رَبِّكَ يُسَبِّحُونَ لَهُۥ بِٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ وَهُمۡ لَا يَسۡـَٔمُونَ ﴿٣٨﴾ )

١٣ـ لە کۆتایی سورەتی (النجم) .﴿ فَٱسۡجُدُواْۤ لِلَّهِ وَٱعۡبُدُواْ ۩ ﴿٦٢﴾ ﴾

١٤ـ لە ئایەتی بیستویەکی سورەتی (الإنشقاق) ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقُرۡءَانُ لَا يَسۡجُدُونَ ۩ ﴿٢١﴾ ﴾.

١٥ـ لە سورەتی (العلق) لەکاتی خوێندنی ﴿وَٱسۡجُدۡ وَٱقۡتَرِب ۩ ﴾.

ئەم پانزە شوێنە سوننەتە هەرکاتێ کابرا خوێندی سوجدە ببات، بەڵام ئەگەر لە نوێژدا بو بۆ سوجدەی(ص) سوجدە نەبات، چونکە سوننەتێکی دوپات کراوە(غیر المؤكدة) نیە والله أعلم.

## ٩٧ سورەتی قەدر ٥

سورەتی قەدر کە پێنج ئایەتە، نەوەدو حەفتەمین سورەتی قورئانە، هەندێ لە زانایان پێیان وایە لە مەککەدا هاتوەتە خوارەوە، هەندێکیش دەڵێن ئەم سورەتە باسی عیبادەتی شەوی قەدر دەکات کە لە مانگی رەمەزاندایە کەواتە لە مەدینە پاش واجب بونی رۆژوی رەمەزان دابەزیوە واتە پاش سورەتی (موتەفیفین)و پێش سورەتی (بەقەرە) دابەزیوە.

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ بەڕاستی ئێمە قورئانمان ناردوەتە خوارەوە لە شەوی قەدردا. وشەی (قدر) بە مانای بەرێزو بەفەڕە یان بە مانای ئەندازەگیریو بڕیاردانە، کە هەردوو ماناکەی ڕاستە هەم شەوێکی بەنرخو بەفەڕو پیرۆزە، چونکە قورئانی پیرۆزی تێدا هاتوەتەخوارەوە کە مایەی خۆشبەختی مرۆڤە لە هەردوو ژیاندا ئەگەر پەیرەوی بکات، هەم لەم شەوەدا هەمو ساڵێك خوای داناو بەئاگاو بەدەسەڵات ڕۆژیو ژیانو چۆنیەتی هەڵسوکەوتو ڕووداوو بەسەرهاتەکانی هەر مرۆڤێك دیاری دەکاتو بە فریشتەی مەئموری دەسپێرێت، بەڕاستی هەردوو بەڵگەی زانایيو توانایيو ئاگایی بێسنوری خوایە، جا شایستەیە کە مرۆڤ ئەو شەوە بناسێت ئەوەتە ﷲ دەفەرموێ:

٩٧ سُورَةُ القَدْرِ ٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةِ ٱلْقَدْرِ ﴿١﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ ﴿٢﴾ لَيْلَةُ ٱلْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴿٣﴾ تَنَزَّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ ﴿٤﴾ سَلَٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ ﴿٥﴾

٩٨ سُورَةُ البَيِّنَةِ ٨

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

لَمْ يَكُنِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ مُنفَكِّينَ حَتَّىٰ تَأْتِيَهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿١﴾ رَسُولٌ مِّنَ ٱللَّهِ يَتْلُوا۟ صُحُفًا مُّطَهَّرَةً ﴿٢﴾ فِيهَا كُتُبٌ قَيِّمَةٌ ﴿٣﴾ وَمَا تَفَرَّقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَةُ ﴿٤﴾ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلْقَيِّمَةِ ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ وَٱلْمُشْرِكِينَ فِى نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ ۚ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ شَرُّ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٦﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمْ خَيْرُ ٱلْبَرِيَّةِ ﴿٧﴾

﴿٢﴾ کێ و چی تۆی ئاگادارکردوەتەوە کە شەوی قەدر چیە؟ واتە، تۆ نازانیت بۆیە خوای ڕۆشنی دەکاتەوەو دەفەرموێ:

﴿٣﴾ شەوی قەدر خێرو بەفەڕترە لە هەزار مانگ کە ئەو شەوەی تێدا نەبێتو بەندایەتیو چاکەی ئەو شەوە بە هەزار مانگ دادەنرێت

واتە: هەشتاوسێ ساڵو چوار مانگ، بەم شێوەیە ﷲ ئەگەر چی تەمەنی ئەم ئوممەتەی کەم کردوە، بەڵام بەو شەوە چاکەی تەمەن درێژەکانی پێ بەخشیوە (لە ﷲبەزیادبێت) پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: {مَن قامَ لَيلَةَ القدر إيمانا واحتِساباً غُفِرَ لَهُ ماتَقدّم من ذَنبِه /متفق عليه/ هەر کەسێك شەوی (قەدر) نەخەوێتو باوەڕی بە ﷲ هەبێتو تەنها چاوەڕانی پاداشت لەو بکات، چاوپۆشی دەکرێت لە هەموو تاوانێکی کە لە پێش ئەو شەوەدا کردویەتی}

جا تەماشای ئەو بەخششە گەروەی ﷲ بکەن لەو شەوەدا هەم چاکەی زیاتر لە هەشتاوسێ ساڵی بۆ دەنوسرێتو هەم چاوپۆشی لە هەموو تاوانەکانی پێشوی دەکرێت، ئەو شەوە یەکێکە لە شەوە تاقەکانی دەهەمی کۆتایی ڕەمەزان بەتایبەت شەوی بیستو حەوتەم،

معاوییەی کوڕی ئەوبوسوفیان دەڵێت: پێغەمبەر ﷺسەبارەت بە شەوی قەدر فەرموێ: {لَيْلَةُ الْقَدْرِ لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ/ابوداود، صحيح الألباني/ شەوی قەدر شەوی بیستو حەوتەمە}

﴿٤﴾ زۆرێك لە فریشتەکانو جبرەئیل لەو شەوەدا دادەبەزنە سەر زەویو خێرو فەڕێکی زۆر لەگەڵ خۆیاندا دەهێنن. وشەی (روح) واتە جبرەئیل، وە هەندێکی تر دەڵێن: (روح) فریشتەیەکی ترە وەکو لە سورەتی (النباء)دا هاتوە، بەڵێ ئەم فریشتانە دادەبەزن، بەڵام بۆ جێ بەجێکردنی فەرمانی ﷲ وەك دەفەرموێ: ئەو دابەزینە بەهۆی ماوە پێدانی پەروەردگاری خۆیانەوەیەو هەموو کاروبارێکیان پێ سپێردراوە، دەشگونجێت ﴿مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾ پەیوەندی بە ﴿سَلَٰمٌ هِىَ﴾وە هەبێت واتە: ئەو شەوە بێ زیانەو هیچ شتێکی خراپی تێدا ڕوونادات. هەتا ڕووناکی بەیانی پەیدادەبێتو نوێژ دەبێت، دەشگونجێت بەم شێوەیە مانای بکەین ﴿هِىَ حَتَّىٰ مَطْلَعِ ٱلْفَجْرِ﴾ ئەو شەوە کاتەکەی تا نوێژی بەیانیە. یان ،

﴿٥﴾ ئەمنو ئاسایشو خێرو بەرەکەتە ئەو شەوە هەتا ئەو کاتەی نوێژی بەیانی دەبێت، ئەم مانایانە هەمویان نزیکن لەیەکەوەو گرنگ ئەوەیە کە بەندایەتی ئەو شەوە ئەو خێرە گەورەی هەیەو شەوێکی هێمنو ئاسودەیەو هیچ شتێکی خراپی تێدا ڕوونادات، وەبەهۆی دابەزینی ئەو هەموو فریشتە بەرێزانەوە کاروباری ساڵی ئایندەی خەڵکی بە مەئموری تایبەتی خۆی دەدرێتو مەئمورەکان دەزانن کە ئەو کەسە تا ساڵێکی تر شەوی (قەدر) چی کردارێك دەکاتو چی پێدەدرێتو چی لەو کەمدەکاتو چی بەسەردێت، وە بەندایەتی ئەم شەوە دەبێت بەهۆی چاوپۆشی خوای میهرەبان لە تاوانی بەندایەتیکەرەکە، جا هەرکەس نەیتوانی بەچاکی کەڵك لەو شەوە بەنرخە وەرگرێت بەراستی خەیرو بەرەکەتێکی گەورەی ئاوای لەدەستچوە کە بۆهیچ کەس جگە لە موجاهید نارەخسێت، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە پێغەمبەرمان ﷺدەفەرموێ: {مَوقِفُ ساعةٍ في سَبيلِ اللهِ خَيرٌ مِن قيامِ لَيلَةِ القَدرِ عَندَ الحَجَرِ الأَسوَدِ/ ابن حبان، صحيح الألباني/ خۆگری کاتێك لە جیهاد لە پێناو ﷲ دا زۆر چاکترە لە شەو نوێژی شەوی قەدر لە لای بەردەرەشەکەی کەعبەدا}. ﷲ لە تاوانی منو ئێوەی موسڵمانیش خۆشبێت -ئامین-.

٩٨ سورەتی بەیینە ٨

سورەتی بەیینە لای زۆربەی زانایان لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، هەشت ئایەتە، نەوەدو هەشتەمین سورەتی قورئانە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین سەدویەکەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الطلاق) و پێش (الحشر) دابەزیوە، هەروەها بە سورەتی (المنفكين، لم يكن، البرية)یش ناوبراوە. ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ بە ئوبەی کوڕی کەعبی فەرمو: {إِنَّ اللهَ أَمَرَنِي أَنْ أَقْرَأَ عَلَيْكَ لَمْ يَكُنْ

﴿الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ قَالَ وَسَمَّانِي قَالَ نَعَمْ فَبَكَى﴾ /متفق عليه/

بەڕاستی اللَّهُ فەرمانی پێکردوم کە بخوێنم بەسەرتا ﴿لَمْ يَكُنِ الَّذِينَ كَفَرُوا﴾ ئوبەی وتی: ئایا خوا ناوی بردم بۆت؟ پێغەمبەر ﷺ فەرموی: بەڵێ، جا ئوبەی گریا}.

بەناوی اللَّهُی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بێباوەڕان لەوانەی کە پەڕاویان پێدراوە (گاورو جولەکە)و لە بت پەرستان لەخوانەناسیوبت پەرستی وازیان نەهێنا تا ئەو کاتەی کە بەڵگەی ڕوونو ئاشکرایان دێتەلا.

(٢) پێغەمبەرێکە کە لەلایەن خواوەبۆیان ڕەوانەکراوە کە محمدی کوڕی عەبدوڵایە کە هەر لە زاتی خۆیدا بەڵگەی ڕوون هەبو لەسەر ڕاستیو دروستیو پەیڕەوانی پەڕاوانی پێشو وەکو کوڕی خۆیان دەیانناسیو هەڕەشەشیان لە بت پەرستان دەکردو دەیانوت: کاتێك ئەو هات ئێمە پەیڕەوی دەکەینو ئێوە لەناودەبەینو بت پەرستانی مەکەیش ڕاستیو دەستو دەمپاکی ئەویان لە مانگی چواردە لەلا ڕۆشنتربو ناویان نابو (محمد الامين/ موحەممەدی دەستو دەمپاك) واتە: هەر زاتی ئەو پێغەمبەرە ﷺ بەڕێزە بەڵگەیەکی ڕون بو لەلای هەمویان، کەئێستایش قسەی پەروەردگاری جیهانیان بۆ دەکاتو چەندین پەڕەی پاکۆکراوە لە شتی زیادەو بێ ناوەڕۆك دەخوێنێتەوە بەسەریاندا،

- بەڵکو لەناو ئەو پەڕە پاکۆکراوەدا چەندین باسو فەرمانی ڕاستو دروستو بەنرخی تێدایە، چونکە لەلایەن خواوە هاتوە، بەڕاستی ڕەوشتو بەڵگەکانی ڕاستی پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە ڕون بون خاوەن پەڕاوان هەمویان یەکدەنگ بون لەسەر پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرمان ﷺ، بەڵام پاش ئەوەی کەفەرمانی پێغەمبەرایەتی بۆهاتو فەرمانی خوای بەوان گەیاند ڕژدیو ڕقو قین وای لێکردن کە دژایەتی بکەنو خۆیان بەدرۆ بخەنەوە لێرەش دەفەرموێ:

(٤) جا ئەوانەی کە پەڕاویان پێدرابو بەش بەش نەبون هەتا بەڵگەی ڕوونو ئاشکرا هاتەلایان کە محمدﷺ بو، واتە وەك وتمان لەپێشدا یەکدەنگبون کەپێغەمبەرێك دێتو ئێمە پەیڕەوی دەکەین بەڵام کاتێ هاتوبەچاکیش دەیان ناسی هەریەکەیان بەشێوەیەك دژایەتیان دەکردو باوەڕیان پێ نەکرد، جا خوا دەفەرموێ:

(٥) خۆ ئەمانە ئەمریان پێ نەکرابو مەگەر تەنها بەوەی کە بەندایەتی خوا بکەن بەشێوەیەکی پاڵفتەییو دڵسۆزانەو خۆیان یەکلا بکەنەوە بۆ ئەوزاتە بەگوێرەی ئەو یاساو بەرنامەیەی کە بۆیان هاتوەو لادەن لە هەمو ڕێبازێكو تەنها ڕێبازی خوا بگرنەبەر، وە نوێژ بە ڕێكوپێکی ئەنجام بدەنو زەکات بدەت، وەئەوەی کە باسکرا (لە بەندایەتی بێ غەڵ و غەشو دورکەوتنەوە لە هەمو ڕێبازو ڕێچکەکان بێجگە لە ڕێبازی خواو ئەنجامدانی نوێژو زەکاتدان) ئەوەیە ئایینی ڕاستو دروستو بەنرخ، ئینجا باسی سزاو پاداشتی بێباوەڕان دەکاتو دەفەرموێ:

(٦) بێگومان ئەوکەسانەی کە بێباوەڕبون لە پەڕاوداراننو لە بت پەرستان لەناو ئاگری دۆزەخدان بۆ هەمیشەیی، ئەوانە پیسترین دروستکراوی خودان، چونکە هەمو دروستکراوێکی پەروەردگار بێجگە لە مرۆڤ لەو یاسایەی کەبۆی دانراوە تێناپەڕێت، بەڵام مرۆڤی بێباوەڕ لە هەمو سنورێك تێدەپەڕێتو هەمو ئیشێکی ناپاكو نادروست ئەنجام دەدات کە گەورەترینیان بێباوەڕیە بەخواو بە پێغەمبەران، وەکو لە سورەتی ئەنفال دا دەفەرموێ: ﴿بەبێگومان خراپترینی ئەوانەی کەبەم سەر زەوییەدا دەڕۆن ئەو کەڕو لاڵەن کەفامی هیچ ناکەن﴾ وە لە سورەتی ئەعراف دا دەفەرموێ: ﴿ئەوانە وەك چوارپێ وان بەڵکو سەرلێ شێواوترن، ئەوانە هەرخۆیان بێ ئاگان﴾. ئینجا اللَّهُ سەبارەت بە باوەڕدران دەفەرموێ:

(٧) بەڕاستی ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کرداری چاکیان ئەنجامداوە، ئەوانە باشترین دروستکراوی خودان، کۆمەڵێك لەزانایان ئەم ئایەتە دەکەن بە بەڵگە لەسەر ڕێزو گەورەیی مرۆڤی باوەڕدار بەسەر فریشتەکاندا، منیش ئەم ڕایەم بەلاوە نزیکترە، ئەگەرچی فریشتە هەرگیز تاوان ناکات چونکە وا دروستکراوە بەڵام باوەڕداران بە دژایەتی نەفسو شەیتانو زەحمەتدانی خۆیان بەندایەتی خودا دەکەن، کەواتە دەبێت پاداشتیان زیاتر بێتو پاداشتی زیادەیش زۆرجار دەبێت بە بەڵگە لەسەر پلەی بەرزتر (وە هەر خوا زانایە).

پێغەمبەرمان ﷺ جارێکیان بۆ یارەکانی باسکرد کە: لەپاش ئەوان کەسانێك دێن کە چاکەی هەریەك لەوان بە چاکەی پەنجا کەس دەنوسرێت، یارەکان وتیان: پەنجا کەس لە ئێمە یان لەخۆیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: پەنجا کەس لە ئێوە چونکە ئێوە یارمەتیدەرتان هەیە لەسەر چاکە بەڵام ئەوان یارمەتیدەریان نیە. (ئەبوداودو ترمزیو ئیبنوماجە) ئەمەیان هێناوە. جا باسی پاداشتی باوەڕداران دەکاتو دەفەرموێ:

(٨) پاداشتی ئەوان لەلای پەروەردگاری خۆیان بەهەشتانێکە کە جێگای دانیشتنەو لەژێر ئەو بەهەشتانەدا چەندین جۆگا دەڕوات، وەکو لە سورەتی (محمد)دا فەرموی چوار جۆگەن، وە بۆ هەمیشە لەناو ئەو بەهەشتانەدا دەمێننەوەو هەرگیز دەرناچن

جَزَآؤُهُمۡ عِندَ رَبِّهِمۡ جَنَّٰتُ عَدۡنٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ لِمَنۡ خَشِيَ رَبَّهُۥ ﴿٨﴾

## ٩٩ سُورَةُ الزَّلزَلَةِ ٨

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا ﴿١﴾ وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا ﴿٢﴾ وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا ﴿٣﴾ يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا ﴿٤﴾ بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ﴿٥﴾ يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ﴿٦﴾ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ﴿٧﴾ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ﴿٨﴾

## ١٠٠ سُورَةُ العَادِيَاتِ ١١

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَٰدِيَٰتِ ضَبۡحٗا ﴿١﴾ فَٱلۡمُورِيَٰتِ قَدۡحٗا ﴿٢﴾ فَٱلۡمُغِيرَٰتِ صُبۡحٗا ﴿٣﴾ فَأَثَرۡنَ بِهِۦ نَقۡعٗا ﴿٤﴾ فَوَسَطۡنَ بِهِۦ جَمۡعًا ﴿٥﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ﴿٦﴾ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ﴿٧﴾ وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ ﴿٨﴾ ۞ أَفَلَا يَعۡلَمُ إِذَا بُعۡثِرَ مَا فِي ٱلۡقُبُورِ ﴿٩﴾

لێی، خوا ڕازیە لێیانو ئەوانیش ئەوەندە حاڵیان خۆشەو لە شوێنو جێگای چاکدان ڕازین لە پەروەردگاریان کە ئەو هەمو نیعمەتەی پێداون، جا ئا ئەم هەمو خەڵاتو بەخشینو ڕێزە گەورە بۆ ئەو خاوەن باوەڕیە کە لە پەروەردگاری خۆی ترساوە واتە: بەندەی ڕاستەقینە دوو شت پاڵی پێوەدەنێت بۆ چاکەکردن **یەکەم**: بەتەمای لێخۆشبونی ﷲ یە. **دووەهەم**: لێی دەترسێت وەك لە سورەتی سەجدە ئایەتی شانزە دا دەفەرموێ: ﴿بەندایەتی پەروەردگاری خۆیان دەکەن کەدەترسنو هیواداریشن،وە لەوەیش کە پێمان داون دەبەخشن﴾.

## ٩٩ سورەتی زەلزەلە ٨

سورەتی زەلزەلە لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، هەشت ئایەتە، نەوەدو نۆهەمین سورەتی قورئانە هەندێك لەزانایان پێیان وایە ئەم سورەتە لە مەدینەدا دابەزیوە، جا لەسەر ئەمە بەگوێرەی دابەزینی نەوەدو چوارەمین سورەتە کە پاش سورەتی (**النساء**) و پێش (**الحدید**) دابەزیوە.

پێغەمبەر ﷺ وئەم سورەتە بە نیوەی قورئان دادەنێت دەفەرموێ: {إِذَا زُلْزِلَتْ تَعْدِلُ نِصْفَ الْقُرْآنِ /الترمذي، صححه الالباني/ سورەتی زەلزەلە بەرامبەری نیوەی قورئانە}

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ هەر کاتێك زەوی زۆر بەپەلەو بەتوندی جوڵێنرا

﴿٢﴾ جا زەوی تەواوی بارە گرانەکانی دەر کرد وەك پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { تَقِيءُ الْأَرْضُ أَفْلَاذَ كَبِدِهَا أَمْثَالَ الْأُسْطُوَانِ مِنْ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قَتَلْتُ وَيَجِيءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِي وَيَجِيءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ فِي هَذَا قُطِعَتْ يَدِي ثُمَّ يَدَعُونَهُ فَلَا يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا/مسلم وغيره/ زەوی هەموخەزانەکانی خۆی فڕە دەداتە دەرەوە وەك پایە و کۆڵەکەکانی خانو لە زێڕو لەزیو ئەوسا بکوژدێتو دەیبینێو دەڵێت: لەسەر ئەمە من کوشتم، وەپەیوەندی بچڕانی خزمان دێت،جا دەڵێت:لەسەرئەمە من پەیوەندی خزمایەتیم بچڕی، وەدزدێت ودەڵێت: لەسەر ئەمە دەستم بڕا، پاشان بانگ دەکرێن بەڵام هیچی لێ وەرناگرن}.

﴿٣﴾ جا مرۆڤ دەڵێت: ئەمە چی بوەو بۆوادەکات؟ هەرچەند وشەی مرۆڤ گشتیە بەڵام مەبەست تایبەتکراوە (**عام مخصوص**) چونکە باوەڕداران بەو شێوە ناپەشۆکێن بەڵکو دەڵێن: ﴿ئەوە بەڵێنی خوای بەخشندەیەو ڕاستیانکرد ڕەوانەکراوەکان﴾ (یس/٥٢.واتە ئەمانە لەدنیادا ڕودەدەن، ئینجا دەفەرموێ:

﴿٤﴾ ئا لەو ڕۆژەدا زەوی بەسەرهاتەکانی خۆی باسدەکات، جادەگونجێت هەربە قسە ئەو دەنگوباسە بۆ خەڵك باسبکات یان بە ڕوداوەگرنگو پەر مەترسیەکانی خەڵکی تێدەگەیەنێت کە چی بوە، وەدەشگونجێت لێرە بەدواوە پاش زیندوبونەوەبێت کە لەو ڕۆژەدا زەوی هەرچی هەواڵێکی لەلایە باسی دەکاتو کەس ناتوانێت لە قسەی خۆی حاشابکات، واتە زەوی تەواوی دەنگەکان کۆدەکاتەوەو هیچی تێکەڵاو بە هیچی نابێت، بۆ نمونە لە ڕۆژانی حەجدا بە ملیۆنەها حاجی هەریەك داوای شتانێك دەکەنو بە سەدەها دەنگو سەدەها زمانو لە مەیدانی عەرەفاتو موزدەلیفەو شوێنی ڕەجم دا هەموی نرکەی دێت، بەڵام یەك قسە تێکەڵاوی قسەیەکی تر نابێتو هەریەکەی لە بۆرییەکی تایبەتیەوە دەردەچێتو بەو شێوەیە دەمێنێتەوە تا ڕۆژی دوایی، جا ئەو کاتە کە کاتی دادگای کردنی مرۆڤە زەوی وەکو باقی دروستکراوەکانی خوا دێتە قسەو هەمو دەنگو باسەکانی سەری دەگێڕیتەوە، جا پێویستە مرۆڤی خاوەن باوەڕ ئاگای لە زمانی بێتو قسەی وانەکات لەو کاتەدا شەرمەندە ببێت، چونکە زەوی ناتوانێت هیچی بشارێتەوە وەك دەفەرموێ:

﴿٥﴾ چونکە بێگومان خوای تۆ نیگای کردووەتە لای و فەرمانی پێداوە بە هەڵگرتنی هەواڵەکانو خستنەدەرەوەی مردوەکانو پاشان بڵاوکردنەوەی دەنگوباسەکەیان، ئینجا دەفەرموێ:

(٦) لەو ڕۆژەدا خەڵك بەشێوەی جیاجیا دەردەچێت هەندێك چاكەو هەندێك خراپەو هەندێكیش لەو نێوانەدایە تا بچن‌و كردارەكانی خۆیان ببین.

(٦) ئەوسا هەركەس بە ئەندازەی زەڕەیەك چاكە بكات لە دنیادا لەوێ دەیبینێتەوەو پاداشتی وەرگرێتەوە ئەگەر بە شتی تر بەتاڵی نەكردبێتەوە.

(٧) خۆ هەركەسێكیش بە ئەندازەی زەڕەیەك خراپەی كردبێت دەیبینێتەوەو سزای وەردەگرێت، ئەگەر چاوپۆشی لێ نەكرابێت. لەبارەی زەكاتی چارەوێ و كەرەوە پرسیار لە پێغەمبەرﷺ كرا فەرمویْ:{ الْخَيْلُ لِرَجُلٍ أَجْرٌ وَلِرَجُلٍ سِتْرٌ وَعَلَى رَجُلٍ وِزْرٌ فَأَمَّا الَّذِي لَهُ أَجْرٌ فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَأَطَالَ بِهَا فِي مَرْجٍ أَوْ رَوْضَةٍ فَمَا أَصَابَتْ فِي طِيَلِهَا ذَلِكَ مِنْ الْمَرْجِ أَوْ الرَّوْضَةِ كَانَتْ لَهُ حَسَنَاتٍ وَلَوْ أَنَّهُ انْقَطَعَ طِيَلُهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ كَانَتْ آثَارُهَا وَأَرْوَاثُهَا حَسَنَاتٍ لَهُ وَلَوْ أَنَّهَا مَرَّتْ بِنَهَرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلَمْ يُرِدْ أَنْ يَسْقِيَ كَانَ ذَلِكَ حَسَنَاتٍ لَهُ فَهِيَ لِذَلِكَ أَجْرٌ وَرَجُلٌ رَبَطَهَا تَغَنِّيًا وَتَعَفُّفًا ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِي رِقَابِهَا وَلَا ظُهُورِهَا فَهِيَ لِذَلِكَ سِتْرٌ وَرَجُلٌ رَبَطَهَا فَخْرًا وَرِيَاءً وَنِوَاءً لِأَهْلِ الْإِسْلَامِ فَهِيَ عَلَى ذَلِكَ وِزْرٌ وَسُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ عَنْ الْحُمُرِ فَقَالَ مَا أُنْزِلَ عَلَيَّ فِيهَا شَيْءٌ إِلَّا هَذِهِ الْآيَةُ الْجَامِعَةُ الْفَاذَّةُ فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ/ متفق عليه/ چارەوێی سیانن ئەو بۆ هەندێ كەس پاداشتەو بۆ هەندێ داپۆشەرەو بۆ هەندێ تاوانە، جا ئەوەی كە ئەو دەبێ بە پاداشت بۆی ئەو پیاوەیە كە بۆ جیهاد ڕاگیری دەكات جاماوەیەكی زۆرلە لەوەرگەو باخچەدا بەخێوی دەكات، ئەمە هیچ شتێك ناخوات لەو لەوەرگەوباخچەیە مەگەر اللَّهُ بۆی بە پاداشت بنوسێت، جا ئەگەر لەولەوەرگادا پەتەكەی ببچڕێت‌و بڕوات ئەگەر بەرزاییەك، یان زیاتریش ببڕێت بۆ هەمو بەرزای‌وجێ سم‌وتەرسەكەی چاكەی بۆ دەنوسرێت، جائەگەر بە ڕوبارێكدابڕواو ئاوی لێ بخوات بەبێ ئەوەی كەخۆی مەبەستی ئاودانی بێت چاكە گەلێكی بۆ هەیە ، ئەوەی كە داپۆشەرەبۆی ئەوە ئەو پیاوەیە، كە ئەو چارەوێی بۆ بەخشندەی‌و ئیشی جوانەو مافی پشتی وسكی لە بیر ناچێتەوە، واتە: چاكەی پێدەكات بۆ خەڵك لە بارو لە سواری‌و لە تەنگانەو خۆشی دا، ئەوەی كە تاوانە ئەو كەسەیە، كە چارەوێی بۆ خراپی‌و لوت بەرزی‌و خۆپیشاندانە بە خەڵك ئەوە ئەوەیە، كە ئەبێ بە تاوان لەسەرخاوەنەكەی، وتیان: ئەی گوێدرێژ ئەی پێغەمبەری خواﷺ؟ فەرموی: خوا لەو بارەیەوە هیچی بۆ نەناردوم، بێجگە لەم ئایەتە گشتیە كەم وێنەیە، ﴿ئەوسا هەر كەسێك بە ئەندازەی گەردیلەیەك چاكە بكات، پاداشتەكەی دەبینێ، وە هەر كەسێكیش بەئەندازەی گەردیلەیەك خراپە بكات سزاكەی دەبینێ﴾ وشەی زەڕە بە مێرولەی سوری ورد دەڵێن وە هەم بەو شتە وردانە دەڵێن: كە كاتێك ڕۆژ لە دەلاقەیەكەوە دەچێتەناو ژورێكی تاریكەوە شتی وردی تێدا دەبینرێت یان ئەو شتە زۆر وردەیە كە ئەمرۆ بە زەڕە ناوی دەبەن.

بەڕاستی ئەو كەسەی كە ئاگای لەم سورەتە هەبێت پاشەڕۆژی خۆی خراپ ناكات‌و هەوڵی ئەوە دەدات كە لەو ڕۆژەدا سەربەرز بێت.

## (١٠٠) سورەتی عادیات (١١)

سورەتی عادیات هەندێك پێیان وایە لە مەككەدا پاش سورەتی (العصر) و پیش (الكوثر) هاتوتە خوارەوە، یانزە ئایەتە، سەدەمین سورەتی قورئانەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین چواردەهەمین سورەتە، هەندێكیش پێیان وایە ئەم سورەتە لە مەدینە دابەزیوە، لەم سورەتە بەڕێزە گەورەیی‌وبەرزی پلەو پایەی تێكۆشەرانی ڕێگای اللَّهُ بەجوانی دەردەكەوێت، ئەوەتا دەبینین خوای گەورە سوێند بەو ولاخانە دەخوات كە موجاهیدین سواریانن‌و جیهادیان پێدەكەن، دەی دەبێ موجاهیدەكان خۆیان چ ڕێزو پلەیەكیان هەبێت لە لای اللَّهُ؟

بەناوی اللَّهُ ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بەو ئەسپانەی كە لەكاتی جیهاددا غاردەدەن‌و نركەی سكیان دێت،

(٢) جا ئاگر دەكەنەوە بە سمیان كاتێك كە بەغار دەڕۆن بەسەر بەرددا و لەژێر ناڵەكانیاندا بزیسكەی ئاگر بەرزدەبێتەوە ئەوەندە توندو چالاكن لە تاودان‌و ڕمبازیدا،

(٣) ئینجا لەگەڵ ڕووناكی بەرەبەیاندا پەلاماری دژمن دەدەن،

(٤) جا لەو شوێنەدا تەپوتۆز هەڵدەستێنن،

(٥) ئەوسا دەچنە ناوەڕاستی دوژمنەوەو هەمویان وەك یەك كەس بەسەر دژمندا دەدەن‌و هیچیان دواناكەون‌و خۆ ناگرنە دواوە، بەڵكو هەمویان خۆیان دەكوتنە ناوەڕاستی دژمنەوە یان خۆیان دەخەنە ناوەڕاستی تەواوی دژمنانەوە، ئەوەندە نەترس‌و گیانفیداو ئامادەی شەهادەتن، بەڕاستی گەلێك كەئاوابێت دورە شكست بهێنێت هەروەكو بینیمان حكومەتە بچكۆلەكەی ناو شاری مەدینە بە ماوەیەكی زۆركەم لە هەمو لایەكەوە گەیشتە سەر دەریا، بەڵام كاتێك خۆشەویستی ماڵ‌و گیان لەناو دەرونی باوەڕدارانداا پەرەی سەند هەمولایەكیان لەدەستچوو، بەڵكو خۆیان كران بە بەندەو ژاردەستی كافران‌و خۆمان بەخۆمان

وَحُصِّلَ مَا فِي ٱلصُّدُورِ ﴿١٠﴾ إِنَّ رَبَّهُم بِهِمْ يَوْمَئِذٍ لَّخَبِيرٌۢ ﴿١١﴾

## سُورَةُ القَارِعَةِ ١٠١ — ١١

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلْقَارِعَةُ ﴿١﴾ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٢﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا ٱلْقَارِعَةُ ﴿٣﴾ يَوْمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلْفَرَاشِ ٱلْمَبْثُوثِ ﴿٤﴾ وَتَكُونُ ٱلْجِبَالُ كَٱلْعِهْنِ ٱلْمَنفُوشِ ﴿٥﴾ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾ وَمَآ أَدْرَىٰكَ مَا هِيَهْ ﴿١٠﴾ نَارٌ حَامِيَةٌۢ ﴿١١﴾

## سُورَةُ التَّكَاثُرِ ١٠٢ — ٨

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلْهَىٰكُمُ ٱلتَّكَاثُرُ ﴿١﴾ حَتَّىٰ زُرْتُمُ ٱلْمَقَابِرَ ﴿٢﴾ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ثُمَّ كَلَّا سَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾ كَلَّا لَوْ تَعْلَمُونَ عِلْمَ ٱلْيَقِينِ ﴿٥﴾ لَتَرَوُنَّ ٱلْجَحِيمَ ﴿٦﴾ ثُمَّ لَتَرَوُنَّهَا عَيْنَ ٱلْيَقِينِ ﴿٧﴾ ثُمَّ لَتُسْـَٔلُنَّ يَوْمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٨﴾

ڕاوکراینو ڕاودەکرێین، بە دەستی خۆمان سەروەتو سامانی وڵاتی ئیسلامیمان خستە ناو دەست دژمنانەوە (لاحول ولا قوه إلا بالله). بەڕاستی پەلامارو ئاگرکردنەوەی سمی ئەسپانو هێرشی ناو دژمنانو خۆ خستنە ناو کۆڕی دژمنان لە بەرەبەیانیدا، ئەسپەکان خۆیان نەبون بەڵکو سوارەکان بون، چونکە چاك خوای خۆیان ناسی بو، وە چاك لە کەم تەمەنیو لەناوچونی دنیادا ئاگاداربوون، بەڵام وەك وتمان کاتێك ئەو باوەڕە چاکە نەما ئەوەمان بەسەرهات کە لەبەر چاوتاندایە! ئینجا خوا دەفەرموێ:

﴿٥﴾ بەڕاستی مرۆڤ زۆر سپڵەوبێنمەکە سەبارەت بە پەروەردگاری خۆی، وا دەزانێت ئەو سەروەتو سامانەو ئەوهێزو دەسەڵاتە تەنها بە زرنگی خۆی دەستی کەوتوە، جا ئیتر زۆر لوتی بەرز دەبێتو مافی خاوەن مافان نادات‌و لە فەرمانەکانی ﷲ دەردەچێت وەك لە سورەتی عەلەق دا دەفەرموێ﴿بەحەقیقەت بێگومان کە مرۆڤ لەخۆی بای دەبێت کاتێ کە دی بێنیازە﴾ لە پاشان دەفەرموێ:

﴿٧﴾ وە بەبێگومان کە ئەو کابرایە خۆی یان پەروەردگار لەسەر ئەم بێنمەکیو سپڵەییو ڕژدیەی شایەتە، جا ڕونتر ڕژدیو سپڵەییو بێ نمەکی کابرا باسدەکاتو دەفەرموێ:

﴿٨﴾ خۆ بەبێگومان ئەو کابرایە ماڵی زۆر خۆشدەوێت وەك لە سورەتی فەجردا دەفەرموێ: ﴿وە ئێوە ماڵی میراتیش دەخۆن بە خواردنێکی نا دروستو ناڕەواو ئێوە ماڵتان زۆر زۆر خۆشدەوێت﴾ ئینجا خوای میهرەبان دڵەکان ڕادەپەڕێنێتو وایان لێدەکات کە دنیا زۆر بە گرنگ نەگرنو دەفەرموێ:

﴿٩﴾ ئایا هەر دەبێ ئاوا بێنمەكو سپڵەو ماڵ خۆشەویست بێت؟ ئایا نازانێت کە کاتێك زیندو کرایەوەو هێنرایە دەرەوە ئەوەی کە لەناو گۆڕەکاندایە،

﴿١٠﴾ جا ئاشکرا کراو دەرخرا ئەوەی کە لەناو دڵەکاندایە، ئەوکاتە چی دەکەنو پەنا بۆ کێ دەبەن ؟

﴿١١﴾ بەڕاستی پەروەردگاری ئەوان لەو ڕۆژەدا چاك ئاگاداری هەڵس‌وکەوتی پێشویانەو ناتوانن لە هیچ تاوانێك حاشا بکەن، بە چاکان باشترین پاداشت دەداتەوە، جا تۆڵەیش لە تاونباران دەستێنێتو بچوکترین ستەم لە کەس ناکات؟.

## سورەتی قاریعە ١٠١ — ١١

سورەتی قاریعە لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، یانزە ئایەتە، سەدو یەکەمین سورەتی قورئانەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین سی هەمین سورەتە کە پاش سورەتی (قریش) و پیش (القيامة) دابەزیوە، ئەم سورەتە یەکسەر باسی ڕووداوی قیامەتو پاداشتی چاکەکارو سزای خراپەکار دەکات بەشێوەیەکی تازەترو بەناوێکی تری قیامەتەوەو دەفەرموێ:

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

﴿١﴾ قارعەش هەروەکو (حاقة)و (طامة)و (صاخة)و (غاشية) ناوێکە لە ناوەکانی قیامەت، بە مانای کوتانەوەیە، چونکە بە ئەو ڕوداوە زەویو ئاسمانو ئەستێرەو ڕۆژو مانگ هەموی دەکوترێن بەیەکداو چیاکان دەبن بە تۆز، جا جێگای خۆیەتی بە گرنگ تەماشا بکرێت و تێمان بگەیەنێت کە ڕووداوەکە گرنگترو پڕ مەترسی ترن لەوەی کە ئێوە بیری لێدەکەنەوەو دەفەرموێ:

﴿٢﴾ قاریعە چیە؟

﴿٣﴾ چی تۆی تێگەیاندوە کە قاریعە چیە؟ واتە ئەوشتە گەورەترو سامناکترو ماڵ وێرانکەرترە لەوەی کە ئێوە شتێکی لەبارەوە بزانن، ئینجا بەو پرسیارانە واز لە قاریعە دەهێنێتو باسی ئەو بارو شێوەی مرۆڤ دەکات کاتێك کە ئەوقاریعەیە ڕودەداتو دەفەرموێ:

﴿٤﴾ لەو ڕۆژەدا مرۆڤەکان هەمو زیندو دەکرێنەوەو دێنە دەرەوە وەك پەپولەی سەرلێشێواو هەروا دێن بەناویەکدا بێ

ئەوەی مەبەستێك لەو چونو گەڕانەوەدا هەبێت ڕوداوەکە ئەوەندە سەختو دژوارە.

(٥) جا چیاکانیش دەبن بە خوری شیکراوەی ڕەنگاوڕەنگ واتە لە دورەوە وەك چیان، بەڵام لەڕاستیدا هیچ قوەتو هێزێکی تێدانامێنێت وەکو چەند کیلۆ خوری شیکراوە کە جێگایەکی زۆر داگیر دەکات، بەڵام بەهێزێکی زۆر کەم ئازو گۆییاز دەکرێت، پێشەکی چیاکان بەو شێوە دەبن، ئینجا وەکو هەور بەملاو بەولایاندا دەباتو دوایی دەبن بە تۆزو نزمایییەکانی زەوییان پێ پڕدەکرێتەوەو ئەم زەویە دەبێت بە دەشتێکی کاکی بەکاکی وەك لە سورەتی (تاها) دا دەفەرموێ: ﴿لەبارەی چیاکانەوە پرسیارت لێدەکرێت جا تۆ بڵێ: پەروەردگارم دەیانهاڕێت بەهارین، ئەوسا ئەو زەویە دەکات بەدەشتێکی کاکی بەکاکی، کەهیچ نزمیو بەرزایییەکی تێدا نامێنێ﴾ ئینجا بەرەو حیسابمان دەباتو دەفەرموێ:

(٦) جا ئەو کاتە هەر کەس لە کێشانەی کردارەکانیدا چاکەی قورس بو،

(٧) ئیتر ئەوکەسە وا لەناو ژیانێکدا کە ئەو ژیانە بەشێوەیەکی زۆر گرنگو سەرسوڕهێنەرەو رازی کەری خاوەنەکەیەتی، ئەوەتە ئاو بەکەیفی کابرا لەکوێدا بیەوێت هەڵیدەقوڵێنێتو هەر میوەیەکی بوێت میوەکە خۆی لەو نزیك دەکاتەوەو حەزی لەگۆشتی کام باڵندەبێت چۆنی ئارەزۆ لێ بێت ئاوا بۆی ئامادە دەبێت، واتە ئەوژیانە ڕازیکەری کابرایەو هیچ شتێکی ناوێت کەبۆی ئامادەنەکرێت، دیارە کابراش بەو ژیانەپڕ نازو نیعمەتە ڕازییە ئەمە بۆ چاکەکارانە، بەڵام بۆ خراپەکاران دەفەرموێ:

(٨) خۆ ئەو کەسەیش کە لە کێشانەکەیدا چاکەی سوك بوو خراپەکەی قورس بو،

(٩) ئەوسا ئەو کەسە جێگای هاوێیە. ئینجا پرسیار دەکاتو دەفەرموێ:

(١٠) جا تۆ چی دەزانی لەبارەی ئەو (هاویە)وە؟

(١١) ئەو هاویە ئاگرێکی داخکەرو سوتێنەرە کە ئەم ئاگرەی ئەمرۆی ئێمە کە ئاسنی پێ دەتاوێنینەوە بەشێکی زۆر کەمە لەو ئاگرە، وەك پێغەمبەرمان ﷺلە چەند فەرمودەیەکیدا دەفەرموێ: کە یەکێك لەوانە ئەمەیە کە ئەبوهورەیرە ﵁ دەڵێت: بیستم لە پێغەمبەری خوا ﷺ دیفەرمو: { نَارُكُمْ هَذِهِ الَّتِي تُوقِدُونَ جُزْءٌ وَاحِدٌ مِنْ سَبْعِينَ جُزْءًا مِنْ حَرِّ جَهَنَّمَ قَالُوا وَاللَّهِ إِنْ كَانَتْ لَكَافِيَةً يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ فَإِنَّهَا فُضِّلَتْ بِتِسْعَةٍ وَسِتِّينَ جُزْءًا كُلُّهُنَّ مِثْلُ حَرِّهَا /الترمذي، صحححه الألباني/ ئەوئاگرەی کە ئێوە هەڵیدەگیرسێنن بەشێکە لە حەفتا بەش لەگەرمایی ئاگری دۆزەخ، وتیان: بەخوا هەر ئەمەش بێت بەسە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموی: بەڕاستی گەرمایی ئەو شەست ونۆ پلە لەم ئاگرەی دنیا گەرمایی زیاتری پێدراوە. خوا بمان پارێزێ لێی.

## سورەتی تەکاسور ٨ ١٠٢

سورەتی تەکاسور لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، هەشت ئایەتە، سەدو دوومین سورەتی قورئانەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین شانزەهەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الكوثر) و پیش (الماعون) دابەزیوە. دەڵێن دوو تیرەی یارمەتیدەر (الانصار) لە خێلی (بني حارثة وبني الحارث) خۆیان بەسەریەکتردا هەڵدەکێشاو هەریەکەیان دەیوت: ئایا ئێوە پیاوی وەکو فلانو وەکو فیسار ئێمەتان هەیە؟ تەنانەت دەچونە ناو گۆڕستانەوەو مردووەکانیشیان دەژمارد هەروەکو زیندوەکانو دەیانوت: ئایا ئێوە پیاوی وەکو ئەمەو ئەوەتان بووە هەمیشە بەو شتەوە خەریکبون، جا خوا ئەم سورەتەی نارده خوارەوە، تا هەم ئەوان واز لەوە بهێننو هەم دەرسێك بێت بۆ باوەڕداران تا لەدنیادا هەن.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئێوەی سەرگەرم کرد خەریکبوونتان بە زۆرکردنەوە، زۆرکردنی ماڵ، منداڵ، یارمەتیدەرو خزمەتچی تا واتان لێهات کە پاشەڕۆژتان لەیادچو.

(٢) تا ئەو کاتەی کە مردنو چوونە گۆڕەوە، ئەو کاتە بیردەکەنەوە، وە ئاشکرایشە بیرکردنەوەی ئەو کاتە هیچ سوودێکی نابێت بۆتان، بۆیە بەتوندی دڵەکان ڕادەپەڕێنێتو دەفەرموێ:

(٣) نەکەن شتی وا وخۆتان بێ ئاگا مەکەن لە پاشەڕۆژ بەم زوانە دەزانن کە هاتنی پاشەڕۆژو حیسابو بەهەشتو دۆزەخ ڕاستە. دیسان پەروەردگار دەفەرموێ:

(٤) پاشان باش بزانن وانیە، بۆچونەکانتان ڕاست نیەو بەهەڵەدا چوونو بەم زوانەش دەزانن کە چەند سەرلێشێواوو نەزان بوون. ئینجا دەفەرموێ:

(٥) بەڕاستی ئێوە ئەگەر بزانن بە زانینێکی ڕاست بێگومان ئا بەو شێوەیە خۆتان سەرگەرم نەدەکردو ئەم زیانە گەورەتان لەخۆتان نەدەداو لەو ڕۆژەدا شەرمەندەو سەرشۆڕ نەدەبون. ئینجا دەفەرموێ:

(٦) سوێندبێت بەڕاستیو بێگومان ئێوە دۆزەخ دەبینن.

سُورَةُ العَصۡرِ ١٠٣ ٣

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَٱلۡعَصۡرِ ﴿١﴾ إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ﴿٢﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ﴿٣﴾

سُورَةُ الهُمَزَةِ ١٠٤ ٩

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

وَيۡلٞ لِّكُلِّ هُمَزَةٖ لُّمَزَةٍ ﴿١﴾ ٱلَّذِي جَمَعَ مَالٗا وَعَدَّدَهُۥ ﴿٢﴾ يَحۡسَبُ أَنَّ مَالَهُۥٓ أَخۡلَدَهُۥ ﴿٣﴾ كَلَّاۖ لَيُنۢبَذَنَّ فِي ٱلۡحُطَمَةِ ﴿٤﴾ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡحُطَمَةُ ﴿٥﴾ نَارُ ٱللَّهِ ٱلۡمُوقَدَةُ ﴿٦﴾ ٱلَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى ٱلۡأَفۡـِٔدَةِ ﴿٧﴾ إِنَّهَا عَلَيۡهِم مُّؤۡصَدَةٞ ﴿٨﴾ فِي عَمَدٖ مُّمَدَّدَةِۭ ﴿٩﴾

سُورَةُ الفِيلِ ١٠٥ ٥

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَلَمۡ تَرَ كَيۡفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصۡحَٰبِ ٱلۡفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمۡ يَجۡعَلۡ كَيۡدَهُمۡ فِي تَضۡلِيلٖ ﴿٢﴾ وَأَرۡسَلَ عَلَيۡهِمۡ طَيۡرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرۡمِيهِم بِحِجَارَةٖ مِّن سِجِّيلٖ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمۡ كَعَصۡفٖ مَّأۡكُولِۭ ﴿٥﴾

﴿٧﴾ پاشان بەڕاستی ئێوە دۆزەخ دەبینن و ئەو بینینەیش بێگومانەو بە چاوی خۆتان دەیبینن، دەڵێن: ئاگر لەوکاتەدا پرمەیەك دەكات هەمو فریشتە نزیکەکان و پێغەمبەرەکان بەروی ئەژنۆیاندا دەکەون لە ترس و گەورەیی بینینی ئەو ڕووداوە گرنگە وەك لە ئایەتی پەنجاودووی سورەتی کەهفدا دەفەرموێ: ﴿خۆ ستەمکاران ئەوئاگرە دەبینن ئەوسا دڵنیادەبن کە تێیدەکەون و هیچ لادەرێکیش نیە کەلایانبدات لێی﴾

﴿٨﴾ لەپاشان، سوێند بێت لەبارەی تەواوی نیعمەتەکانەوە لەو ڕۆژەدا پرسیارتان لێدەکرێت، هەر لە تەندروستیی و خۆراك و پۆشاکەوە بگرە تا ئاسودەیی و ئاوی فێنك، جا ئەگەر شوکرتان کردبێت و مافەکانی خواتان پاراستبێت و بوبێت بەهۆی زیادە بەندایەتی و چاکەکردن و دوورکەوتنەوە لە تاوان ئەوە دیسان خوا نیعمەتانێکی زۆر زیاترو بێسنورو بەنرخترتان پێدەدات، بەڵام ئەگەر بەهۆی ئەو نیعمەتانەوە زیاتر لەخۆ بایی بووبن و تاوان و ستەمی زیاترتان پێکردبێت ﷻ تۆڵەی سەختتان لێوەردەگرێت وەك لە سورەتی ئەحقاف ئایەتی بیستەمدا دەفەرموێ: ﴿وە ئەو ڕۆژەی کە خوانەناسان رادەگیرێن بەسەر ئاگردا، پێیان دەوترێت: خۆشی خۆتانتان لە ژیانی دنیادا بردووە و لەزەتتان لێوەرگرتوە، ئەوسا ئەمڕۆ بەسزایەکی سوکایەتی سزادەدرێن بەهۆی لوت بەرزی ناڕەواتانەوەو بەهۆی خراپکاری لەسنور بەدەرتانەوە﴾

لەو کاتەی کەئەم ئایەتەدابەزی زوبەیر وتی: { فَأَيُّ النَّعِيمِ نُسْأَلُ عَنْهُ وَإِنَّمَا هُمَا الْأَسْوَدَانِ التَّمْرُ وَالْمَاءُ قَالَ أَمَا إِنَّهُ سَيَكُونُ /الترمذي. حسنه الالباني/ ئەی پێغەمبەری خوا لەکام نیعمەت پرسیارمان لێدەکرێت خۆئیمە هەر ئەودووانەمان هەیە: خورماو ئاو؟ فەرموی: ئاگاداربن کەئەو پرسیار کردنە هەر دەبێت }

پێویستە بزانین کە گۆڕ ماڵێکی کاتیەو دەبێت لێی دەرچین و وشەی ﴿زُرْتُمُ﴾ ئەوە دەگەیەنێت چونکە سەردان گەڕانەوەی تێدایە، بەڵێ دەبێت جارێکی تر لەو گۆڕە بێینەدەرەوە بۆ حەشرو حیساب و بەهەشت و دۆزەخ.

پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەیفەرمو: { أَلْهَاكُمْ التَّكَاثُرُ قَالَ يَقُولُ ابْنُ آدَمَ مَالِي مَالِي وَهَلْ لَكَ مِنْ مَالِكَ إِلَّا مَا تَصَدَّقْتَ فَأَمْضَيْتَ أَوْ أَكَلْتَ فَأَفْنَيْتَ أَوْ لَبِسْتَ فَأَبْلَيْتَ/الترمذي.الالباني:صححه/ هەوڵدان بۆزۆرکردنی سەروەت و سامان سەرگەرمی کردن، فەرموی نەوەی ئادەم هەردەڵێ: ماڵەکەم، ماڵەکەم مەگەر ماڵی تۆ هەر ئەوە نەبوە کەکردوتە بەچاکە ئا ئەوەت بۆماوەتەوە؟ یان خواردوتە خۆڵەناوت بردوە؟یان پۆشیوتە جا رزاندوتە؟}.

سورەتی عەسر ١٠٣ ٣

سورەتی عەسر لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، ئەم سورەتە سێ ئایەتە، سەدو سێهەمین سورەتی قورئانەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین سیانزەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الانشراح) و پیش (العادیات) دابەزیوە.

دەڵێن: عەمری کوڕی عاس پێش ئەوەی موسڵمان بێت چوەتەلای (موسەیلەمەی درۆزن)و پرسیاری لێکردوە چی هاتوە بۆ هاورێکەتان؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: سورەتێکی بۆ هاتوە، وتی کامەیە؟ عەمریش وتی ﴿وَٱلۡعَصۡرِ﴾ تا کۆتایی بۆی خوێندەوە، ماوەیەك بێدەنگ بو ئینجا وتی: منیش شتێکی وەکو ئەوم بۆ هاتوە عەمر وتی کامەیە؟ وتی (يا وَبر ياوَبر إنما أنت أُذنان وَصدر وسائرك حقر نقر/ ئەی وەبر ئەی وەبر تۆ هەر دوو گوێی و سنگێکی باقیت هیچ وپوچ وچاڵ وچۆڵە)

لەپاشدا وتی: ئەی عەمر بەلاتەوە چۆنە؟ عەمریش پێی وت: (واللهِ إنَّكَ لَتعْلَمُ أنِّي أعْلَمُ أنَّكَ تَكْذِبُ/ وەڵڵاهی تۆ دەزانی کە من دەزانم تۆ درۆ دەکەیت) ئاشکرایە وەکو لە پێشەوە زانیت عەمر لەوکاتەدا موسڵمان نەبو، بەڵکو دژمنێکی زۆر سەرسەخت بو بەرانبەر بە ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر ﷺ، کەچی لەو شوێنەدا ئەو شایەتیە گرنگە دەدات (ڕاستی قورئان و درۆزنی موسەیلەمە)، خۆ یارەکانی پێغەمبەرمان ﷺ هەر کاتێك بگەیشتنایە بەیەك جیا نەدەبونەوە تا سورەتی عەسریان نەخوێندایەوە، ئەم سورەتە

ئەوەندە بەرزو بەمانایە کە ئیمامی شافیعی دەڵێت: ئەگەر خەڵکی بیریان لەم سورەتە بکردایەوە بەسیان بو.

بەناوی الله ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) سوێند بە کات کە تەواوی جموجۆڵی مرۆڤ لەودایەو ڕووداوەکان هەروەکو ئیشەکانی مرۆڤ لە چاكو لە خراپ لە کاتدا ڕوودەدەنو لەسەر ئەو چاکەو خراپەی مرۆڤ، بەرزیو نزمی، بەهەشتو دۆزەخ وەردەگیرێت.کات شتێکی بەنرخەو پرسیاری لەبارەیەوە دەکرێت، ئینجا دەفەرموێ:

(٢) بەڕاستی مرۆڤ لە زیاندایە مەبەست تەواوی مرۆڤە واتە هەمو مرۆڤێك لە زیاندایە، بێجگە لەو کەسەی کە ئەم چوار وەسفەی تێدابێت وەك دەفەرموێ:

(٣) مەگەر ئەو کەسانەی کە باوەڕی تەواویان هێنابێت واتە باوەڕهێنان بناغەی موسڵمانیەتیەو تا باوەڕ نەبێت هیچ کردارێكو تارێكو نیەتێکی چاك سودی نابێت بۆ پاشەڕۆژ، بۆیە پاش باوەڕ ئینجا باسی سێ وەسفەکانی تر دەکاتو دەفەرموێ: ئەوسا ئیشی چاکیان کردبێت کە ئەمە هەمو نیەتو وتارو کردارێکی پەسەند دەگرێتەوە، لەبارەی وەسفی سێهەمەوە دەفەرموێ: وە ئامۆژگاری یەکتریان کردبێت لەسەر حەقو ڕاستی کە ئەمەش هەموو کردارێكو وتارێكو نیەتێکی ڕاستو دروست دەگرێتەوە، ئاشکرایە ئەوانەی کە باوەڕی ڕاستیان هێنابێتو ئیشی چاکیان کردبێتو ئامۆژگاری یەکتریان کردبێت لەسەر حەقو ڕاستی، گرفتاری سەخت ڕویان تێدەکاتو پێویستیان بە دەرمانی ئەو سەختیو گرفتاریانە هەیە کە ئەویش خۆگرییە، بۆیە لە مەرجی چوارهەمی ڕزگاربونی مرۆڤدا دەفەرموێ: جا ئامۆژگاری یەکتریان کردبێت لەسەر خۆگری لەسەر بەندایەتیو خۆگری لە تاوانکردنو خۆگری لەسەر گرفتاریو کارەساتەکانی ژیان.

ئینجا بەراوردی قسەی درۆزن لەگەڵ قسەی خوادا بکەنو بزانن چەند دوورن لەیەکەوە، دڵنیابن یاسا دەستکردەکانی ئەمرۆی جیهان لە بەرانبەر یاسای خواوە هەروەکو قسەکەی (ئەبو موسیلەمەی درۆزنە) لە بەرانبەر سورەتی (والعصر)دا بەبێ جیاوازی، بەڵام چی دەکەیت لەم ڕۆژگارەدا پیاوێکی وەکو عەمری کوڕی عاسمان تێدا نیە (لاحول ولا قوة إلا بالله).

## سورەتی هومەزە ٩ ١٠٤

سورەتی هومەزە لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، نۆ ئایەتە، سەدو چوارەمین سورەتی قورئانەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین سیو سێهەمین سورەتە کە پاش سورەتی (القيامة ) و پیش (المرسلات) دابەزیوەو بە سورەتی (ٱلْحُطَمَةُ ) ش ناو براوە.

بەناویالله ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) وای دۆزەخ بۆ هەمو تانەو تەشەردەرێك لە خاوەن باوەڕان. وشەی ﴿هُمَزَةٍ﴾ بەو کەسە دەڵێن کە بە قسە تانەو تەشەر دەدات لە خەڵكو ﴿لُّمَزَةٍ﴾ بەو کەسانە دەڵێن بە دەستو ئەبرۆو چاو تانەوتەشەر دەدەن، وە بەپێچەوانەیشەوە مانایان کردوە، گرنگ ئەوەیە کە بزانین الله ئەو هەڕەشە توندە دەکات لەو کەسانەی کە تانەو تەشەر لە خەڵك دەدەنو ناشیرینی دەکەن ئیتر بەهەر شێوەیەك ئەو ئیشە بکەن، ئینجا خوا ڕونتر ئەو مرۆڤە ناپەسەندانە باسدەکاتو دەفەرموێ:

(٢) ئەو کەسەیە کە ماڵی کۆکردوەتەوەو هەر خەریکی ژماردنیەتیو بەو هۆیەوە لە پاشەڕۆژ بێ ئاگایە،

(٣) چونکە وا دەزانێت کە ئەو ماڵەی خۆشبەختی دەکاتو بۆ هەمیشە لە دنیادا دەیهێڵێتەوە، بۆیە پەروەردگاری داناو میهرەبان ئەو جۆرە بێ ئاگاو نەزانانە ڕادەوەشێنێتو دەفەرموێ:

(٤) شتی وا نەکەن ، بەسیەتی نەزانیو نەفامی، بیر لە ئایندەی خۆتان بکەنەوە، چونکە سوێند بێت فڕەدەدرێنە ناو هاڕێرەرەوە، جا پرسیار دەکاتو دەفەرموێ:

(٥) خۆ تۆ نازانی ئەی (محمد) ﷺ ئەو هاڕێرەرە چیە؟ ئینجا خوا خۆی باسی ئەو شوێنە پڕ مەترسیە دەکاتو دەفەرموێ: ئەو هاڕێرەرە

(٦) ئاگرێکی هەڵگرێنراوی خوایە.

(٧) کە دەدات بەسەر دڵەکاندا، ئەم ئاگرە هەمو لەشی دەسوتێنێتو هەروەك بەردی ئاش دەیهاڕێت، کەچی لێرەدا تەنها باسی دڵی کردو فەرموی بەسەر دڵەکاندا دەدات، بۆ؟ چونکە دڵەکان بون کەخاوەنەکانیان سەرگەرم کرد بە کۆکردنەوەی ماڵو عەمبارکردنیو نەدانی حەقی خواو خەڵكو لوتی بەرزکردنەوەو دەستیانکرد بە تانەو تەشەردان لە باوەڕدارو کەمدەستانو ئێشیان گەیاند بە دڵیانو نارەحەتیان کردن، بۆیە وا ئەمرۆ دەبێت قورسایی ئاگرەکە لەسەر دڵەکان بێتو ئاشکرایشە ئێش‌وژانی دڵ لە هەمو ئێش‌وژانەکانی تر سەختترو گرانترە، ئینجا خوا دەفەرموێ:

(٨) بەبێگومان ئەو ئاگرە لەسەر ئەوان داخراوە واتە ڕێگای دەرچونیان نیەو دەنگیان بە هیچ جێگایەك ناگات بەڵكو لەوەش زیاتر،

(٩) لەناو دیرەکی ئاسنین دا تەتەر پێچ کراونو درێژکراون، بەڵێ دنیاپەرستان وایان دەزانی دنیا هەر هی ئەوانەو هەرگیز نامرنو بیریان تەنها لە خۆشیو ڕابواردنی ئەم ژیانە دەکردەوەو هیچ نرخێکیان بۆ باوەڕداران و کەم دەسەڵاتان دانەدەنا تا لەئاکامدا هەناسەی داخو گەرمی خەفەتو مەراقی ئەوان دای لە دڵی ماڵپەرستانی ستەمکارو وەکو پاروو لەناو کوڵەکەی ئاگردا تەتەرپێچ کرانو بەسزای تاوانی خۆیان گەیەنران.

| ١٠٥ | سورەتی فیل | ٥ |
|---|---|---|

سورەتی فیل لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، پێنج ئایەتە، سەدو پێنجەمین سورەتی قورئانە، وتراوە بەگوێرەی دابەزین نۆزدەهەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الكافرون) و پیش (الفلق) دابەزیوە.

بۆ ڕۆشنکردنەوەی مانای ئەم سورەتە پێشەکی بە شێوەیەکی مام ناوەندی باسی ئەو ڕووداوە دەکەین، وەکو ئیبنوکەسیر بۆمان باسدەکاتو دەڵێت: لەپێشەوە باسی (اصحاب الاخدود)مان کرد، ئەوە لە زەمانی پاشایەك لە پاشاکانی حمیەر بەناوی (زونەواس) کە بت پەرست بوە، هەمو باروەڕدارانی ئەو داستانەی پێشوی شەهیدکردوە کە دەڵێن: نزیکەی بیست هەزار نەفەر بون، هیچیان دەرنەچوو بێجگە لە کەسێك کە ناوی (دەوسی زوسەعلەبان) بو کەڕۆیشتو پەنای بردە بەر قەیسەر پاشای شام کە مەسیحی بو دیارە، ئەوانیش لەسەر باوەڕبون بە مەسیح ئەو بەڵایانەیان بەسەرهات، ئەویش نامەیەکی نوسی بۆ نەجاشی پاشای حەبەشە چونکە نزیکبون لەوەوە، دوو کەسی بە ناو (ئەریاتو ئەبرهە)ی کوڕی سەباحی باوکی یەکسوم بە سوپایەکی زۆرەوە نارد، ئەوانیش چوونە یەمەنو داگیریان کردو لەدەست پاشای حیمیەریان سەندەوە، وە زونەواسیش لە دەریادا خنکا، حەبەشە یەمەنی بۆ یەکسەر بووەوە ئەو دوو کەسە سەرپەرشتیان دەکرد، تا ناکۆکی کەوتە نێوانیانەوەو ئامادەی ئەوەبون کە بە دوو سوپا لەیەکتر بدەن، یەکێکیان وتی: بۆ شەڕ بە سوپاکە بکەین با دوو بەدوو لەیەکتر بدەین هەرکاممان ماین ئەوە ببێت بە پاشا، هەردوو هاتنەدەرەوە لەنێوانی دوو سوپاکەداو (ئەریات) هێرشی بردە سەر ئەبرهەو شمشێرێکی دا بە دەم و لوتو ناوچاوانیداو لەتی کرد لەو کاتەدا (عەتودە) کە خزمەتکاری ئەبرهەهە بو پەلاماری (ئەریاتی)داو کوشتیو ئەبرهەهە بە بریندار گەڕایەوەو تیماری برینەکەی کردو چاکبویەوەو بو بە پاشای ئەو سوپایەی کە لە یەمەنی سەربە حەبەشەدابو، جا نەجاشی کاتێك بەمەی زانی زۆر توڕەبو لەسەر ئەو ئیشەی کە ئەبرهەهە کردبویو هەڕەشەی لێکردو سوێندی خوارد دەبێت پێ بخەمە ئەو وڵاتەو مووی ناوچاوانیشت ببڕم، ئەویش هەستا بەدڵ دانەوەی نەجاشیو خەیارماڵیکردنو نمایەندەیەکی نارد بۆ لای بە کۆمەڵێکی زۆر بەخششو دیاری بۆی لەگەڵ یەك تورەکە لە خاکی یەمەنو موی ناوچاوانی خۆیشی بڕیو ناردی لەگەڵیداو لە نوسراوەکەیدا دەڵێت: با پاشا پێ بخاتە سەر ئەم کیسەیە تاکو سوێندەکەی نەکەوێتو ئەوەش موی نێوچاوانمە کە ناردومە بۆ لات، کاتێك کە ئەمە گەیشتە پاشا، سەری سوڕماو لێی ڕازی بو، جا داینا لەسەر جێگای خۆی، ئەبرهەهە کەسێکی ناردە لای نەجاشیو پێی وت: بەڕاستی من کلیسایەك بۆ تۆ دروست دەکەم لە خاکی یەمەندا کە بینای وا پێش ئەو نەکرابێت، ئینجا دەستیکرد بە دروستکردنی کلیسایەکی زۆر گەورە لە (سەنعا)دا زۆر بەرزو گەورەبو و دیوارەکانی بە نەخشو نیگار جوان کردبو کە عەرەب پێیان دەوت (قولەیس) لەبەر بەرزیەکەی، چونکە هەر کەسێك تەماشای بەرزایەکەی بکردایە کڵاوی لەسەر دەکەوت، ئەبرهەهە ویستی حەج لە کەعبەوە بگوازێتەوە بۆ ئەو ماڵە، عەرەبەکانی عدنانیو قەحتانی پێیان ناخۆشبو و قورەیشیش بەمەزۆر ڕقیان هەستا، هەتا یەکێك لەوان چو بۆ یەمەنو چوەناو ئەو ماڵەوەو پیسایی تێکردو گەڕایەوە، خزمەتکارەکەی ئەوەی بینی وبە ئەبرهەهەی پاشایانی گەیاندو وتیان: ئەمە ببێتو نەبێت کاری قورەیشەو بە ڕقو تۆڵەی ماڵەکەی خۆیان وایانکردوە، لەبەرئەوە ئەبرهەهە سوێندی خوارد کە بچێت بۆ مەکەو بەردی بەسەر بەردەوە نەیەڵێتو وێرانی بکات، جا ئەبرهەهە خۆی ئامادەکرد، کەسوپایەکی بەهێزی وای پێکەوەنا کە کەس نەتوانێت بەرگری لێ بکات، چەند فیلێکی گەورەیشی لەگەڵ خۆیدا برد بەتایبەت فیلێکیان کە نەجاشی بۆی ناردبو بەناو (محمود) کە زۆر گەورەو بەهێزبو کە ژمارەی ئەو فیلانە هەندێك دەڵێن هەشت بونو، هەندێکی تر دەڵێن دوازدە بون، وەژمارەی بێجگە لەمانەیش وتراوە (والله أعلم) ئەمەش بۆ ئەوەبو کە زنجیریان پێوە ببەستنو بیخەنە هەر چوار دیوارەکەی کەعبەوەولێیان خورنو یەکجار ماڵەکە بڕوخێنن، کاتێك عەرەب بەمەیان زانی ئەمەیان زۆر بەلاوە سەختو گەورەبو بە پێویستیان زانی کە بەرگری لەو ماڵە پیرۆزە بکەن، لەبەرئەوە پیاوێك لە پیاوە گەورەکانی یەمەن کە ناوی (زونەفەر) بو کە خاوەن قسەو دەسەڵات بو گەلەکەی خۆی بانگ کردو هەرکەسێکی تر لە عەرەب کە بەگوێی کردو ئامادەی کرد بۆ جیهادو بۆ پاراستنی ماڵی خواو شەڕکردن لەگەڵ

ئەبرەهەدا، کۆمەڵێك وەڵامیان دایەوەو شەڕیان کرد لەگەڵ ئەبرەهەداو شکاندنی، لەبەر ئەو شتەی کە خوا دەویست لە ڕێزو گەورەیی کەعبەودواتر (زونەفەر)یش گیرا، ئینجا لەگەڵ خۆیدا هێنایو بەرەو خاکی (خەسعەم) هاتو (نوفەیلی) کوڕی (حەبیبی خەسعەمی) لەناو گەلەکەی خۆیدا بەناو (شمرانو ناهیس) بەرەنگاری ئەبرەهە بویەوە، بینیان ئەوانیشی شکاندو (نوفەیلیشی) گرتو ویستی بیکوژێت لەپاشان عەفوی کردو لەگەڵ خۆیدا هێنای تا ڕێنمایی ڕێگایان بۆ بکات، کاتێك کە نزیکبونەوە لە خاکی (تائیف) چوونەدەرەوە بۆ پێشوازیو چاپلوسی تاماڵەکەی خۆیان کە پێیان دەوت (اللات) بپارێزێت، ڕێزێکی زۆریان لێگرتو پیاوێکیشیان بەناوی (ابوریغال) لەگەڵدا نارد بۆ شارەزایی ڕێگا، کاتێك ئەبرەهە گەیشتە (موغەممەس) کە نزیکی مەکە بو دابەزیو وشترو مەڕو ماڵاتی ئەهلی مەکەی تاڵانکرد کە دوو سەد وشتری عەبدولموتەلیبی تێدابو، دیارە ئەو تاڵانەیش بە فەرمانی ئەبرەهە بو کە بە فەرماندەی گرۆهی پێش قەرەوڵی کە ناوی (ئەسوەدی کوڕی مەفسود)بو، وت بوی. ئینجا ئەبرەهە (حوناتەی حمیەری) نارد بۆ مەکەو داوای کرد کە شەریفترین پیاوی قورەیش بێتەلایو پێیان بڵێ کە پاشا نەهاتوە شەڕتان لەگەڵدا بکات مەگەر ڕێگای بگرن، جا حوناتە هاتو خەڵکیش عەبدولموتەلیب یان پێ ناساند، ئەویش قسەی ئەبرەهەی بەو گەیاندو عەبدولموتەلیبیش وتی: سوێند بە ﷲ ئێمەیش نامانەوێت شەڕبکەین لەگەڵیداو توانای ئەومان نیە، ئەمە ماڵی خوایەو قەدەغەکراوەو ماڵی خۆشەویستی خوایە کە ئیبراهیمە، ئەگەر ئەو بەرگری بکات لێی ئەوە ماڵی خۆیەتیو قەدەغەی کردووەو ئەگەر وازیشی لێ بهێنێت هەر خۆی خاوەنیەتی، بەﷲ قەسەم ئێمە توانای پاراستنیمان نیە، حوناتە وتی: وەرە لەگەڵم بۆ لای، ئەویش چو لەگەڵیدا کاتێك ئەبرەهە بینی زۆر ڕێزی لێگرت، عەبدولموتەلیب پیاوێکی ڕێكوپێكو سەرو سیما جوان بو، ئەبرەهە لەسەر تەختەکەی خۆی هاتە خوارەوەو لەسەر بەڕەدا لەگەڵیدا دانیشت، جا بەو کەسەی کە زمانی ئەبرەهەو عەبدولموتەلیب ی دەزانی وت: بڵێ پێی هیچ داخوازیەکی هەیە؟ ئەویش وتی: داخوازیم گەڕاندنەوەی ئەو دوو سەد وشترەیە کە بردوتانە، ئەبرەهە بە کابرای وت: پێی بڵێ پێشەکی زۆر نرخی بو لەلام، بەڵام ئێستا لەبەرچاوم کەوت کە داوای دوو سەد وشتر دەکات، داوای ئەوە ناکات کە ئێمە واز لەو ماڵە بهێنین کە ئایینی خۆیو باوباپیریەتی، عەبدولموتەلیب یش وتی: من خاوەنی ئەو وشترانەم ئەو ماڵەیش خاوەنی خۆی هەیەو بەم زوانە دەیپارێزێت، ئەبرەهە وتی: ناتوانێ لە منی بپارێزێت، ئەویش وتی: ئەوە تۆو ئەوو، جا ئەبرەهە کۆمەڵێك خەڵکی لەگەڵدابو، بەڵێنیاندا کە یەکێك لە سێ بەش لە سەروەتو سامانی (تیهامە) بە ئەبرەهە بدەن کە بگەڕێتەوەو واز بێنێت لە ڕووخاندنی ئەو ماڵە پیرۆزە، ئەویش قبوڵی نەکرد لێیانو وشترەکانی عەبدولموتەلیبی دایەوەجا عەبدولموتەلیبیش گەڕایەوە بۆ لای قورەیشو پێی وتن: لە مەکە دەرچنو بچنە سەر چیاکان نەوەکو بەهۆی ئەو سوپاوە دوچاری ئێشو ئازارببن، لەپاشان عەبدولموتەلیب چو حەڵقەی کەعبەی گرتو چەند کەسێکی تریشی لەگەڵدابو و پاڕانەوە لە خواو داوای کرد کە خوا سەریان بخات بەسەر ئەبرەهەو سوپاکەیدا، ڕۆیشتنو سەد وشتریان گەردن بەند کردە ملو لەلای ئەو ماڵە پیرۆزەدا بەجێیان هێشت، بەڵکو ئەو لەشکرە دەستدرێژیان بۆ بکەنو خوا تۆڵەیان لێ وەرگرێت، کاتێك کە ڕۆژ بویەوە، ئەبرەهە خۆی ئامادەکرد بۆ ئەوەی بێتەناو مەکەو فیلەکانیان بەرێ خست لەو کاتەدا (نوفەیل ی کوڕی حەبیب) هاتە تەنیشت فیلەکەو گوێی گرتو وتی: ئەی (محمود) بکەوە لێرە یان بگەڕێوە لەکوێ هاتوویت بەڕاستی تۆ لە شاری ﷲ ی کە قەدەغەکراوە، پاشان گوێی بەرداو فیلەکە کەوت (نوفەیل) بەپەلە دەرچو هەتا گەیشتە سەر چیاکە، دایان لە فیل کە هەڵبستێت بەڵام هەڵنەستا، ئینجا بە تەوشێیو تەورزێن لە سەریاندا عەسایان لەدواوە تێ بڕی هەڵنەستا، بەڵام ڕویان دەکردە هەرلایەك هەڵدەستاوبەپەلە دەڕۆی کە ڕویان دەکردە مەکە دەکەوت، ئینجا خوا چەند پۆلێك باڵندەی لە دەریاوە بەشێوە پەڕەسێلکەو ڕیشۆڵە بۆ ناردن، کە هەر باڵندەیەك سێ دەنکە بەردی لە قوڕی سورەوەکراوی پێ بو بە دەنوکیو هەردوو لاقیەوە بەشێوەی نۆكو نیسك لە هەرکەسیان بدایە ئەوە یەکسەر دەکوژراو هەمویان بەم بەڵایە توشبونو نەیان دەزانی بەرەو کوێ بڕۆنو هەر هەواڵ پرسی (نوفەیل)یان دەکرد کە ڕێگایان پیشان بدات، نوفەیلیش لەسەر چیاکەدا تەماشای دەکردن، کە ﷲ چۆن تۆڵە لەو تاوانبارانە وەردەگرێت، فیلەکان هەمو دەرچونو ئەبرەهە خۆی بەرکەوت، بەڵام کتوپڕ نەمرد هەر ساتێك نینۆکێك لە لەشی هەڵدەوەری تا گەیشتە وڵاتی (خەسعەم)و لەوێ مرد، جا ئا لەم ساڵەدا پێغەمبەری ئایزمان ﷺ لەدایکبووە ﷲ ئەمە بە نیعمەتێکی گەورە دادەنێت بۆ قورەیشو داوایان لێدەکات کە بەگوێی بکەنو پەیڕەوی پێغەمبەر ﷺ ببنو ئەو ڕوداوە دەخاتە بەر چاویانو دەفەرموێ:

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئایا نازانی خوای تۆ چی کرد بە خاوەن فیلەکان؟ واتە بێگومان تۆ ئەم هەواڵەت زانیوە، ئینجا خوای بەئاگاو دانا وەڵامی

سُورَةُ قُرَيْشٍ ١٠٦ — ٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

لِإِيلَٰفِ قُرَيْشٍ (١) إِۦلَٰفِهِمْ رِحْلَةَ ٱلشِّتَآءِ وَٱلصَّيْفِ (٢) فَلْيَعْبُدُوا۟ رَبَّ هَٰذَا ٱلْبَيْتِ (٣) ٱلَّذِىٓ أَطْعَمَهُم مِّن جُوعٍ وَءَامَنَهُم مِّنْ خَوْفٍۭ (٤)

سُورَةُ المَاعُونِ ١٠٧ — ٧

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

أَرَءَيْتَ ٱلَّذِى يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ (١) فَذَٰلِكَ ٱلَّذِى يَدُعُّ ٱلْيَتِيمَ (٢) وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلْمِسْكِينِ (٣) فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ (٤) ٱلَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ (٥) ٱلَّذِينَ هُمْ يُرَآءُونَ (٦) وَيَمْنَعُونَ ٱلْمَاعُونَ (٧)

سُورَةُ الكَوْثَرِ ١٠٨ — ٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِنَّآ أَعْطَيْنَٰكَ ٱلْكَوْثَرَ (١) فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ (٢) إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ (٣)

پرسیارەکەی بۆ ڕۆشن دەکاتەوە بەشێوەی پرسیارێکی ترو دەفەرموێ:

(٢) ئایا فڕوفێڵی ئەوانمان لەناو نەبردو نەمانکرد بە شتێکی ون بو؟ بەم شێوەیە کە دەفەرموێ:

(٣) جا الله باڵندەکانی نارده سەریان پۆل پۆل کە هەر یەکەیان ڕاسپێردراو بو بۆ لەناوبردنی سێ کەس .

(٤) کەتیربارانیان کردن بە بەردێك کە لە قوڕی بەئاگر سورۆکراو دروستکرابو لەنێوان نۆك و نیسکدا، باڵندەکانیش بەشێوەی پەڕەسێلکەو ڕیشۆڵەبون هەر بەردێکیان لە کەسێك دەدا کتوپڕ هەمو ئەندامەکانی لەشی دادەڕزاندو بە ماوەیەکی زۆر کەم ئەو لەشکرە گەورەیەی کە لە پێشەوە لەناو داستانەکەدا باسمانکرد تارومار کرانو لەناوچون، ئەوەتە دەفەرموێ:

(٥) هەر بەدوای لێدانەکانیدا الله وەکو کای خوراوی لێکردنو ئێسك و پروسکەکانیان ئەوەندە وردو وشکبونەوە کە بەشێوەی کای خوراو (تەرسی چارەوێو ئێسترو کەر)ئەگەر دەستیان لێبدرایەورد ورد دەبون، ئا بەو شێوەیە الله ئەو لەشکرەی لەناو بردو ماڵەکەی خۆی پاراستو سەروەتو سامانێکی زۆری ئەو لەشکرە کەوتە دەستی قورەیش، لەو ساڵەدا پێغەمبەرمان ﷺ لەدایکبوە، ئەگەرچی قورەیش بت پەرستبونو ئەبرەهەو پەیڕەوانی مەسیحی بون بەڵام شکان لەبەر ئەو هۆیانە:

**یەکەم-** چونکە لەشکرێکی ستەمکاربو، خوا بەو شێوەیە تارومار کردن.

**دووهەم-** بت پەرستی تاوانێکی نێوان بەندەو خوایە، بەڵام دەستدرێژیو ستەم تاوانێکی نێوان بەندەکانە، الله بۆ تۆڵە سەندنەوەی مافی خۆی پەلە ناکات، بەڵام بۆ تۆڵەسەندنەوەی مافی خەڵك بەپەلەیە.

**سێهەم-** ئەگەرچی مەکە بت پەرستانی تێدایە، بەڵام خۆ ئەوان تەنها مەبەستیان لەناوبردنی ماڵی خوابو، ئەوەبو ئەبرەهە بە (عەبدولموتەلیبی) وت: ئێمە نەهاتوین شەڕ لەگەڵ ئێوەدا بکەین ئەگەر ڕێگامان نەگرن بۆ ڕووخاندنی ئەو ماڵە.

**چوارهەم-** ئەگەرچی خەڵکی مەکە بت پەرستبون بەڵام الله ماڵەکەی خۆی مەبەستەو دەیەوێت بیپارێزێت، پاشان بیکات بە جێگای هاتنی پێغەمبەر کۆتایی و بیکات بەجێگای یەکێك لە بەندایەتیە فەرزەکانی پەیڕەوانی ئاینەکەی کەحەجەو کۆنفرانسی ساڵانەی موسڵمانانە، وە هەروەها بەڵگەیەك بێت لەسەر ڕاستیو دروستی ئەو پێغەمبەرە (الارهاص) ئەوەتە خوا بەو شێوەیە ئەو جێگایە دەپارێزێت تا کەسێکی ئاوای تێدا بکات بە پێغەمبەر، جا ئەگەر ئەو پێغەمبەرە نەبوایە خوا ئیشی وای بۆچی دەکرد؟.

## ١٠٦ سورەتی قورەیش ٤

ئەم سورەتە کە بە سورەتی قورەیش واتە کوڕانی نەزری کوڕی کینانە دەناسرێت، لە مەکەدا هاتوتە خوارەوەو چوار ئایەتە، سەدو شەشەمین سورەتی قورئانە کە وتراوە بە گوێرەی دابەزین بیستو نۆهەمین سورەتە کە پاش سورەتی (التین)و پێش سورەتی (القارعة) دابەزیوە.

بەناوی الله ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئەوەمان هێنا بەسەر لەشکری ئەبرەهە کە لە سورەتی پێشودا باسکرا لەبەر پاراستنی ئاسایشو کۆکردنەوەی قورەیش یان لەبەر ئەو عادەتەی قورەیشو لەبەر یەکبونو پەیدابونی دۆستایەتی بۆیان، کام عادەت؟

(٢) ئەو عادەتەیان کە کاروانیان دەکرد لە زستاندا بۆ یەمەنو لە هاوین دا بۆ شام، جا بەبۆنەی ئەو ماڵەوە ڕێزیان لێدەگیراو کەس دەستدرێژی نەدەکردە سەریانو بەشێوەیەکی باش دەژیان واتە: تارێزی کەعبە پایەداربێ وئەوان بتوانن لەوڕیزەکەڵك وەرگرنو بێترس هاتوچۆی خۆیان بکەن و لەکەس نەترسن و بەوهۆیەوە بژێوی خۆیان پەیدابکەن، جا خوا ئەو نیعمەتە بەنرخە دەخاتەوە بەر چاویانو دەفەرموێ:

(٣) دەی بەندایەتی پەروەردگاری ئەو ماڵە بکەن،

(٤) کە خوراندنی داوە بەوانو لە برسێتی ڕزگاری کردونو ڕێزی بەوان داوەو لە مەترسی دەست درێژی خەڵکی هێمنی کردونەتەوەو کەس تەمایان تێناکات.

کە بەڕاستی دوو نیعمەتی زۆر گەورەن پێویستە لەسەر قورەیش سوپاسی ئەو پەروەردگارە بکەنو پەیڕەوی پێغەمبەرەکەی ﷺ بکەن، مەگەر ئەوان چواردەوری خۆیان نەدەبینی کە چیان پێدەکرا؟ وەك لە سورەتی عەنکبوت/ ٦٧. دا دەفەرموێ:﴿ئایا ئەوان نابینن کە کردومانە بەماڵێکی بێترس لەحاڵێکدا کە خەڵك لە چواردەوریان چۆن دە رفێنرێن؟﴾ بەڵێ بەڕاستی نەهێشتنی برسێتیو ترس دوو نیعمەتی گەورەن لە ژیانی مرۆڤدا، هەروەکو پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێ: { مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ مُعَافًى فِي جَسَدِهِ آمِنًا فِي سِرْبِهِ عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا/ الترمذی، حسنه الالبانی/ هەر کام لەئێوە ڕۆژی کردەوە لەشی ساغبوو ترسی نەبو لەناو کەس‌وکاری خۆیدابو،وە خواردنی ئەو ڕۆژەیشی هەبو بەڕاستی ئەوە دنیای لەلا کۆبووەتەوە بە هەمو پەلو پۆیەکیەوە}، وە ئەم شارە هێمنو ژیان خۆشیەش وەلامدانەوەی پاڕانەوەی ئیبراهیم بو(علی نبینا وعلیه الصلاه والسلام).

ئەم ئایەتانە تێمان دەگەیەنن ئەرکی سەرشانی مسوڵمانە شۆڕشگێڕو تێکۆشەرەکان بەگشتیو دەسەڵاتی ئیسلامی بەتایبەت دابین کردنی باری ئابوری وڕامیاری خەڵك وهێمن کردنەوەی خەڵك لەترسە، ئەوسا چاوەڕوانی خوا پەرستی ڕێك وڕەوان لەخەڵك دەکرێت، جا بۆیە ئاینی پیرۆزی ئیسلام کە ئاواتی خۆشبەختی وئاسایشی خەڵکەو ڕێگا بەدەستدرێژی کردنە سەر مافی خەڵك وداگیرکردنی سەروەت وسامانیان نادات، وەبۆپارێزگاری لەماڵ ولەگیان تیژترین وسەخت ترین سزای لەبەرچاوگرتوە، چونکە ئەگەر ئەو پارێزگاریە نەبێت لەژیانی مرۆڤدا بێجگە لەشەڕو شۆڕو تاڵانو بڕۆ شتێکی تر وەبەرچاوناکەوێت، جائیسلام بۆپارێزگاری گیان وماڵ یاسای بەهێزوتێرو تەواوی داناوە، بەڵکو پێیشی وایە کە تائەو دوو لایەنە دابین نەکرێت خواپەرستی ڕاست وڕەوان ناکرێت.

## سورەتی ماعون ١٠٧ — ٧

سورەتی ماعون لە مەکەدا هاتوتە خوارەوە، حەوت ئایەتەو سەدو حەفتەمین سورەتی قورئانەو وتراوە بەگوێرەی دابەزین حەڤدەهەمین سورەتە کە پاش سورەتی (التکاثر) و پیش (الکافرون) دابەزیوەو بە سورەتی (أَرَءَيْتَ ) یان (ٱلدِّينِ)یش ناو براوە.

بەناوی اللّٰه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) ئایا تۆ نابینی ئەو کەسەی کە باوەڕی بە ڕۆژی قیامەت نیە؟ واتە ئەگەر نابینی یان نای ناسیت گوێ بگرە تا پێناسەکەیت بۆ بکەم،

(٢) ئەوسا ئەوە ئەو کەسەیە کە پاڵ بە هەتیوە دەنێتو بە سووك تەماشای دەکاتو مافی دەخواتو چاکەی لەگەڵدا ناکات.

(٣) جا ئەو کەسەیشە کە با خۆیشی چاکە بکات لەگەڵ فەقیراندا بەڵام بێجگە لە خۆی هەڵنانێت بۆ چاکەکردن لەگەڵ بێنەوایاندا، ئەوە وەسفی بێباوەڕان بو بە ڕۆژی قیامەت وەکو لە سورەتی فەجر دا دەفەرموێ:﴿وانیە کەئەوان دەڵێن، بەڵکو ئەوان ڕێزی هەتیو ناگرن، وەخەڵکی هەڵنانێن لەسەر خواردن دان بە کەمدەستان﴾ ئینجا دەفەرموێ:

(٤) وای دۆزەخ بۆ نوێژگەران؛

(٥) ئەوکەسانەی کە لەبارەی نوێژەکانیانەوە سستی دەکەن چ لەکاتی خۆیدا دوای بخەنو چ بە ڕێك‌وپێکی ئەنجامی نەدەنو چ بیری لێ نەکەنەوەو هێمنیو گەردنکەچی بە لەشو سیمایاندا دیارنەبێت، کاتێك نوێژ دەکەن کە هەر کەس یەکێك لەو وەسفانەی تێدابێت بەر هەڕەشەی ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەوێت جا (پەنا بە اللّٰه) ئەگەر کەسێك هەر سیانی تێدابێت بەڵگەی مونافیقی کرداری بە تەواوی تێدایە ئەوەتە پێغەمبەرمانﷺ باسی ئەو جۆرە نوێژە دەکاتو دەفەرموێ: {تِلْكَ صَلَاةُ الْمُنَافِقِ يَجْلِسُ يَرْقُبُ الشَّمْسَ حَتَّى إِذَا كَانَتْ بَيْنَ قَرْنَيْ الشَّيْطَانِ قَامَ فَنَقَرَهَا أَرْبَعًا لَا يَذْكُرُ اللَّهَ فِيهَا إِلَّا قَلِيلًا/متفق علیه) ئەوە نوێژی مونافقە، دادەنیشێتو چاوەڕوانی ڕۆژە هەتا وای لێدێت دەکەوێتە ناو دوو شاخەی شەیتانەوە (نزیکی ڕۆژئاوابون)کەهەڵدەستێت ئەوساچوار دەنوك لە زەوی دەدات، یادی خوای تێدا ناکات مەگەر کەمێك} هەم نوێژی دواخستوەو هەم بەباشیش ئەنجامی نەداوەو هیچ گەردنکەچیەکی پێوە دیارنەبوە، ئاشکرایە ئەم کردنەیش لەبەر خەڵکە ئەگینا نەیدەکرد، وەکو لە وەسفی دووهەمی ئەو نوێژخوێنەدا دەفەرموێ:

(٦) ئەو کەسانەن کە ڕیایی دەکەن تا خەڵك چاوی بکەوێتە پێیانو نەڵێن نوێژنەکەرن، لەم سورەتەدا باسی بێباوەڕ کرا بە ڕۆژی دواییو لەناو باسەکەدا باسی نوێژخوێنانی ناتەواو و شێوە مونافیقی کردو ئینجا گەڕایەوە سەر وەسفێکی تری بێباوەڕان بە ڕۆژی دواییو دەفەرموێ:

(٧) جا بەرگریش دەکەن لە شتی پێویستی خەڵك جا ئەو شتە پێویستیەکی دیاری بێت وەکو زەکات یان هەر پێویستیەکی تر کە لەلای ئەوان دەست بکەوێتو کەسانی تر نەیانبێتو داوایان لێ بکەنو پێیان نەدەن وەکو ساجو هێڵەكو تەوشێ هەتا دەرزی، عەبدوڵاهی کوڕی مەسعود دەڵێت: { كُنَّا نَعُدُّ الْمَاعُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ عَوَرَ الدَّلْوِ وَالْقِدْرِ/ ابوداود،حسنه الألباني/ ئێمە لەسەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ بەئەمانەت دانی سەتڵی ئاوهەڵکێشانو دێزەمان بە ماعون دادەنا}

بەڵێ ئا بەم شێوەیە ئایینی ئیسلام داوا لە خاوەن باوەڕان دەکات کە هەمیشە خەریکی چاك کردنەوەی نێوانی خۆیان بن لەگەڵ یەکتردا بە ئەنجامدانی ئیشی چاكو دووركەوتنەوە لە شتی خراپ، ئەو شتانەی کە ببن بەهۆی دەنگ لەیەکتر وەرگرتنو بەشبەشیانو هەوڵی بەتینکردنی پەیوەندی نێوان خۆیانو خوایان بدەن کە نوێژ گەورەترین ڕێگای ئەو پەیوەندیە بەنرخەیە، داوامان لێدەکات کە کەمتەرخەمی تێدانەکەین.

لەم سورەتەوە یاسایەکی فیقهیمان دەست دەکەوێت ئەویش ئەوەیە ئایەت بێ زانینی پێشوو پاشەکەی مانا ناکرێت چونکە ﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ﴾ ئایەتێکی سەربەخۆیە، جا ئەگەر تەماشای پاش خۆی نەکەیت مانکردنی پڕ مەترسیە واتە:وای بۆ نوێژخوێنان. هەروەکو ئایەتی هەشتاوهەشتی سورەتی تاها دەفەرموێ:﴿لەشی گوێرەکەیەکی بۆدروستکردن کە قوڕەی هەبو جا وتیان: ئەمە خوای ئێوەو خوای موسایە جا موسا لەبیری چوە﴾.

## ١٠٨ سورەتی کەوسەر ٣

سورەتی کەوسەر لە مەدینەداو هەندێك دەڵێن لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوە، وەك سورەتی مەسدو سورەتی عەصر سێ ئایەتە، بەڵام وشەو پیتەکانی لەوان کەمترە.

دەڵێن ئەم سورەتە لەبارەی عاسی کوڕی وائیلەوە هاتوە کە هەر کاتێك باسی پێغەمبەر ﷺ بکرایە لەلای دەیوت باسی مەکەن وەجاخ کوێرە هەر مرد ئیتر ناوی نامێنێت، لە فەرمودەیەکدا کە مسلم هێناویەتی، ئەنەس دەڵێت لەکاتێکدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەناو ئێمەدا بو لە مزگەوتدا کەمێك بێهۆشی گرتی لەپاشان سەری بەرزکردەوەو زەردەخەنەیەکی کرد، وتمان: چ شتێك پێی کەناندی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرموی: هەرئێستا سورەتێکی قورئانم بۆ هات، جا دەستی کرد بە خوێندنەوەی لە (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ إِنَّآ أَعۡطَيۡنَٰكَ ٱلۡكَوۡثَرَ ١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنۡحَرۡ ٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلۡأَبۡتَرُ ) ئینجا فەرموی: (دەزانن کەوسەر چیە؟ وتمان خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ زاناترن، فەرموی: جۆگەیەکە پەروەردگارم بەڵێنی پێداوم کە خێرێکی زۆری پێوەیە، ئەوە حەوزێکە ئومەتەکەم لە ڕۆژی قیامەتدا ئاوی لێدەخواتەوەو کاسەکانی بە ژمارەی ئەستێرەکانە، هەندێ خەڵکیشی لێ قەدەغەدەکرێت، جا من دەڵێم: پەروەردگارم ئەوە ئومەتی منە، خوایش دەفەرموێ: بەڕاستی تۆ نازانیت ئەوە چی داهێنا لەپاش تۆ} چەندین فەرمودەی تر لەم بارەوە هەیەو زۆربەی قورئان خوێنان ئەمە دەکەن بە بەڵگە لەسەر ئەوەی ئەو سورەتە لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، چونکە ئەنەسی کوڕی مالیك کە چۆنیەتی دابەزینی سورەتی کەوسەری باسکرد لەسەرەتای هیجرەتدا ئیمانی هێناوە، وەزۆرێك لە زانایان دەڵێن: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) لەم سورەتەدا بەشێکەو لەگەڵ سورەتەکەدا هاتووەتە خوارەوە.

بەناوی ٱللَّه ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بەڕاستی ئێمە شتی زۆرمان بەتۆ داوە، لە پێغەمبەرایەتیو قورئانەوە بگرە هەتا بەرزکردنەوەی ناوتو تکاو شەفاعەتی گەروەت لە ڕۆژی قیامەتداو حەوزی کەوسەر ئاشکرایە هەمو نیعمەتێکی ٱللَّه سوپاسی دەوێتو گەورەترین سوپاسی خوایش نوێژە بۆیە لەپاش ئەوەی کە فەرموی خێری زۆرمان پێداویت دەفەرموێ:

(٢) دەی تۆیش نوێژبکە بۆ پەروەردگاری خۆتو قوربانی بکە بە گیانو بە ماڵ بۆ ڕازیکردنی پەروەردگارت.

جا هەروەك چۆن نوێژ عیبادەتەو پێویستە تەنها بۆ ٱللَّه بکرێت هەروەها قوربانی کردنیش وایە بۆیە پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: { لَعَنَ اللَّهُ مَنْ ذَبَحَ لِغَيْرِ اللَّهِ /مسلم وغيره/ بەرنەفرینی خواکەوێ ئەوکەسەی کە بۆ جگە لە ٱللَّه قوربانی دەکات}.

(٣) بەبێگومان ئەو کەسەی کە ڕقی لە تۆیەو تۆ بە دوابڕاوەو وەجاخکوێر دەزانێت کە عاسی کوڕی وائیلو هاو وێنەکانی بو خۆی دوابڕاوەو نائومێدو پاشەڕۆژ خراپە، تۆ ئەو هەمو خێرە گەورانەت بۆ هەیەو ئەویش مەگەر هەر بە نەفرین یادی بکرێت وەکو ئەبوجەهلو هاو وێنەکانی.

بەڵێ بەڕاستی بەرزیو نزمی هەر بەدەست خوایەو هەر ئەو دەتوانێت ئەو جۆرەبەڵێنە بداتو جێ بەجێی بکات، منداڵێکی بەهەتیوی ژیاو و نەخوێندەوار پاش ڕۆیشتنی چل ساڵ تەمەن بەوشێوەیە ئەو زانیاریە گەورەو گرنگەی پێبدەداتو بەماوەی بیستوسێ ساڵ ئەو ناووشۆرەتو پلەو پایەی پێدەدات کە هیچکام لە نەوەی ئادەم پێی ناگات، (يَارَبِّ لَكَ الْحَمْدُ كَمَا يَنْبَغِي

لِجَلَالِ وَجْهِكَ وَعَظِيمِ سُلْطَانِكَ. وصلَّى الله وسلَّم على سيد ولد ادم مُحَمَّدوعلى اله واصحابه واتباعه الى يوم الدين)

## ١٠٩ سورەتی کافرون ٦

سورەتی کافرون سەدو نۆیەمین سورەتی قورئانە، لە مەکەدا هاتووەتە خوارەوەو شەش ئایەتە. وتراوە بەگوێرەی دابەزین هەژدەهەمین سورەتە کە پاش سورەتی (الماعون)و پێش (الفیل) دابەزیوە.

لە سەحیحی موسلیمدا هاتوە لە جابرەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم سورەتەو سورەتی ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ﴾ی لە دوو ڕکاتی تەوافدا خوێندوە، هەروەها ئەبوهورەیرەش دەڵێت: کە پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەم دوو سورەتەی لە سوننەتی پێش نوێژی بەیانیدا خوێندوە.

هەروەها سوننەتە کاتێك کە چوویتە سەر جێگای خەوتن ئەم سورەتە بخوێنی، پێغەمبەرﷺ بەیەکێك لەیارانی فەرمو:{ اقْرَأْ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ ثُمَّ نَمْ عَلَى خَاتِمَتِهَا فَإِنَّهَا بَرَاءَةٌ مِنْ الشِّرْكِ/ ابوداود، صححه الألباني/ سورەتی"قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ " بخوینە پاشان بخەوە کە بەراستی ئەو سورەتە بێزاری دەربڕینو ڕزگاربونە لە شیركو هاوەڵدانان بۆخوا}

پاش ئەوەی لە قسەو بەربەرەکانێدا شکستیان خوارد، هاتن بە شێوەی ئاشتەوایی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا دوان جا لە کاتێکدا کە پێغەمبەر تەواڤ کەعبەی دەکرد هەندێك لەگەورەکانی قورەیش وەك ئەسوەدی کوڕی موتەلیبو وەلیدی کوڕی موغیرە هاتنە لای پێغەمبەر ﷺو وتیان:{ يا مُحمّد هَلُّم فَلْنَعْبُدْ مَا تعبُد وَتَعبُد مَا نَعبُد فَنَشتَرِك نَحنُ وَأنتَ فِي الأَمرِ فَأنزَلَ اللهُ فِيهِم : ﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ﴾ ... إلى آخرها/ صحيح السيرة/ ئەی محمد وەرە با ئێمە ئەوەی کە تۆ دەی پەرەستی بیپەرەستینو تۆیش ئەوەی کە ئێمە دەیپەرەستین بیپەرەستە، جا ئێمەو تۆ هاوبەش دەبین لەم بەرنامەدا یان وتیان: تۆ ساڵێك بەندایەتی خواکانی ئێمە بکە ئێمەیش ساڵێك بەندایەتی خوای تۆدەکەین، جا الله سورەتی کافیرونی ڕەوانەکرد و بەتەواوی نائومێدی کردن لەوجۆرە ڕێکەوتنانە}.

بەناوی الله ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بڵێ : ئەی بێباوەڕان.

## ١٠٩ سُورَةُ الكَافِرُونَ ٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمْ عَٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ ﴿٦﴾

## ١١٠ سُورَةُ النَّصْرِ ٣

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ﴿١﴾ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ﴿٢﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا ﴿٣﴾

## ١١١ سُورَةُ المَسَدِ ٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

تَبَّتْ يَدَآ أَبِى لَهَبٍ وَتَبَّ ﴿١﴾ مَآ أَغْنَىٰ عَنْهُ مَالُهُۥ وَمَا كَسَبَ ﴿٢﴾ سَيَصْلَىٰ نَارًا ذَاتَ لَهَبٍ ﴿٣﴾ وَٱمْرَأَتُهُۥ حَمَّالَةَ ٱلْحَطَبِ ﴿٤﴾ فِى جِيدِهَا حَبْلٌ مِّن مَّسَدٍۭ ﴿٥﴾

(٢) هەرگیز نایپەرستم ئەوەی کە ئێوە دەیپەرستن، دەڵێن پاش ئەوەی لە قسەو بەربەرەکانیدا شکستیان خوارد، هاتن بەم شێوەیە ئاشتەوایی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺدا بکەنو وتیان: تۆ ساڵێك بەندایەتی خواکانی ئێمە (بتەکان) بکە ئێمەیش ساڵێك بەندایەتی خوای تۆدەکەین، جا خوا ئەم سورەتەی ناردو فەرمانی دا بەسەر پێغەمبەردا ﷺکە بەتەواوی دڵنیایان بکات کە ئەو بێزارە لە خواکانی ئەوانو هەرگیز شتی وا ناکات وە بەوانیش بڵێ:

(٣) جا ئێوەیش بەندایەتی ڕاستەقینە ناکەن بۆ ئەو زاتەی کە من دەیپەرستم کە خوای تاكو تەنیایە، تا واز نەهێنن لەو بتانە بە تەواوی.

(٤) سا منیش هەرگیز بەندایەتی ناکەم بۆ ئەو بتانە کە ئێوە پەرستوتانە نە ئێستاو نە لە ئایندەدا، بەندایەتی من بەندایەتیەکی پاكو خاوێنە بۆ پەروەردگارمو وەکو ئێوە ناکەمو کەس ناکەم بە هاوبەشی.

(٥) خۆ ئێوەیش بەندایەتی ناکەن بە ڕێكوپێکی بەو شێوەیەی کە من بەندایەتی دەکەم بەڵکو ئیشەکانتان لەسەر بناغەیەکی پوچو گومانی ناڕەوایە، وەك لە سورەتی نەجم/٢٣ دا دەفەرموێ:﴿ ئەوانە تەنها چەند ناوێکن کە خۆتانو باو باپیرانتان ناوتان بۆ داناون، هیچ بەڵگەیەکی بەهێز نەهاتوە

لەلایەن خوداوە تائەوان دەستی پێ بگرن، بەڵکو ئەوان هەر پەیڕەوی لە گومان دەکەنو ئەوەی کە نەفس ئارەزۆی دەکاتو بە حەقیقەت ئەوان لەلایەن پەروەردگاریانەوە ڕێنماییان بۆ هاتبوو لەسەر زمانی پێغەمبەری خودا ﷺ بەڵام پشتگوێیان خست﴾.

(٦) بیروباوەڕو ئایینو ڕێبازی خۆتان هەر بۆ خۆتانو بیروباوەڕو ئایینو ڕێبازی منیش بۆ خۆم، واتە من تەنها گەیاندنی ئاییینم لەسەرە ئیتر ئێوە کە هەڵی نەبژێرن کەیفی خۆتانەو زۆرتان لێ ناکەم ولە ڕێبازی خۆمیش شتێك کەم ناکەمەوە بۆ ئەوەی کە ئێوە ڕازی ببن، هەندێك دەڵێن ئەم ئایەتە حوکمەکەی بە ئایەتی شمشێر هەڵوەشێنراوەتەوە، بەڵام ئەگەر بەو شێوەیە کە ئێمە مانامان کرد ڕاستیمان پێکابێت هەروەکو خۆیەتیو هەڵنەوەشاوەتەوە.

ئەم سورەتە کورتە هەڵوێستی باوەڕدار دەخاتە پێش چاومان لە بەرامبەر داخوازی بێباوەڕان لە باوەڕداران بۆ دەست کێشانەوە لە هەندێك لە بیروبۆچونەکەیان بۆ ئەوەی کە بتوانن لەگەڵ یەکدا بگونجێن، بێباوەڕان کاتێك لە هەمو هەوڵەکانیان بۆ لەناوبردنی ئیسلام نائومید دەبن هەوڵ دەدەن بەم شێوەیە باوەڕدار توشی فیتنە بکەن جا داوای لێدەکەن واز لە هەندێك لەبیروبۆچونەکانی بهێنێت تا بتوانین پێکەوە بگونجێن، وەك لەئایەتی چلونۆ لە سورەتی مائیدە دەفەرموێ: ﴿ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾ : لەوان وریابە کە توشی فینەت بکەنو گومڕات بکەن لە هەندێ لەوانەی کەالله بۆتۆی ڕەوانەکردوە﴾

جا لەم سورەتەشدا پیشانمان دەدات کە پێویستە باوەڕدار بە هەڵوێستێکی ڕونو ئاشکرا ئەم داخوازی بێباوەڕانە ڕەد بکاتەوەو ڕێگای خۆی بەتەواوی لەوان جیا بکاتەوەو بزانێت کە ئێرا شوێنی شیرن زمانیو ڕازیکردن نیە وەك ئەوەی دەوا بکرێت لەباوەڕدار کە باس لە دەسەڵاتداری ئیسلامی نەکات ئەوسا دەتوانێت بەگوێرەی ئەو یاسایە کە دەستکردی بەشەرە لەدەسەڵاتداریو یاسادا لەگەڵ بێباوەڕاندا هاوبەشی بکات. دیارە ئەوکەسەی کە لەبەرامبەر ئەم داخوازیەوە هەڵوێستەکەی ئەوە بێت کە لەم سورەتەداهاتوە زۆر تۆشی ڕقو قینی بێباوەڕان دەبێت وەك چۆن توشی پێغەمبەرو یارەکانی هات، چونکە ئەوانە کەسانێك بون کە پەروەردگار لەوەسفیان دەفەرموێ: ﴿ وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ كُلِّهِۦ /وە ئێوە بەم قورئانە بەتەواوی باوەڕ دەهێنن بەبێکەمو زۆر... ﴾

وە لەوانە نەبون کە لەباسیاندا دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ جَعَلُواْ ٱلۡقُرۡءَانَ عِضِينَ (٩١) فَوَرَبِّكَ لَنَسۡـَٔلَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ (٩٢) ﴾ حجر. ئەوکەسانەی کە قورئانیان بەش بەش کردو باوەڕیان بە هەندێك هەبو وهەندێکی تریشیان وازلێ هینابو جا سوێند بەپەروەردگارت لە هەمویان پرسیار دەکەین}

## سورەتی نەسر (١١٠) (٣)

سورەتی نەسر لەو سورەتانەیە کە لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەرەوە ﷺ لە مەدینەدا هاتووەتە خوارەوە، سێ ئایەتە، وتراوە دوا سورەتە کە بەتەواوی دابەزیوەو هەندێکیش وتویانە سورەتی تەوبە ئاخرین سورەتە. بەڵام گومانی تێدا نیە کە ئەم سورەتە نیشانەی کۆتایی تەمەنی پێغەمبەری ئازیزمانە ﷺ، جا بۆیە بە سورەتی (التوديع ) یش واتە سورەتی خواحافیزیو ماڵ ئاوای ناو براوە.

بەناوی الله ی زۆر بەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) هەر کاتێك یارمەتی خوا هات و سەرکەوتنو پیرۆزیت بەدەستهێنا، هەر کاتێك ئەو دوو شتەت دەستکەوت.

(٢) جا بینیت کە خەڵك پۆل پۆل دێنەناو بەرنامەو ئایینی خواوە.

(٣) دەی تۆیش چاکتر خوای خۆت بەپاكو خاوێن ڕابگرەو سوپاسی بکە بۆ ئەو هەمو نیعمەتانەی کە پێی داویت و داوای لێخۆشبوونی لێ بکە، بەڕاستی ئەوزاتە زۆر تەوبە وەردەگرێت، بەڵێ ئەوانەی کە ماوەیەك لەپێش هاتنی ئەم سورەتە دژمنی سەرسەختی پێغەمبەر ﷺ بون بەڵام خوا یارمەتیەکی وای بەم پێغەمبەرەدا ﷺ کە سەرکەوت بەسەر سەختترین دژمنیداو ئەو وڵاتەی کە ئەوی لێدەرکرا بە سەرکەوتویی گەڕایەوە سەریو ئەو کەسوکارەی کە زیاتر لە بیستوسێ ساڵبو شەڕیان لەگەڵدا دەکرد بوون بە سەربازو گیان فیدای ڕێبازەکەی، خەڵکی تریش لە گۆشەو کەناری دورگەی عەرەبی تیرەتیرەو دێ بەدێ دەهاتنە خزمەتیو موسڵمان دەبون، وە ئەوەی پێویست بو لە یاسا بۆ خەڵك تا ڕۆژی دوایی هەموی پێگەیشتو ئەویش هەموی بە خەڵکی ڕاگەیاندو سەدانو هەزاران پیاوی وای پێگەیاند کە تا

ئێستایش نە لەبارەی ڕەوانبێژیو نە لەبارەی لێهاتوویی و نەترسی و نە لەبارەی سەربازییەوە وێنەیان نەبووە، هەریەکەیان قورئانێکی زیندوو بوون لەناو خەڵکدا، جا بە هاتنی ئەم سورەتە وەکو لە پێشەوە وتمان پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ هەواڵی مردنی پێدرا، چونکە ئیشی تەواوبوە لە دنیاداو پێویستە بۆ حەوانەوە بەرەو بارەگای بەرزو بەنرخی بۆ لای پەروەردگاری بگەڕێتەوە، جا دەوایکرد لێی کە تەسبیحاتو ئیستغفاری زۆرتربکاتو کۆتایی ژیانی بەمە تەوابکات. بەڵێ تەمەنی پێغەمبەرمان ﷺنیعمەتێکی گەورەبو بۆ خۆیشی‌و بۆ ئوممەتەکەی‌و کۆتایی هەمو نیعمەتێکیش مافی سوپاسکردنی هەیەو پێویستە داوای لێبوردنیش بکرێت لەسەر هەر کەم‌وکوڕیەك کە کرابێت، ئەگەرچی ﷲ لە تاوانەکانی پێغەمبەرمان ﷺ بە تەواوی چاوپۆشی کردووە، بەڵام پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لەخۆی بایی نەبووە بەڵکو زیاتر خۆی شکاندوەتەوە بۆ ﷲ و کاتێك کە دەڵێن بۆ ئەوەندە خۆت ماندوو دەکەیت خۆ ﷲ لە هەمو تاوانەکانت چاوپۆشی کردوە دەفەرموێ: { أَفَلَا أَكُونُ عَبدَاً شَكُوراً؟/ ئایا نابێت منیش بەندەیەکی سوپاسگوزاربم؟}

تەنانەت پاش ئەم سورەتە زۆرجار لە ڕکوع‌و سوجدەدا دەیفەرمو:{ سُبحَانَكَ اللهُمَّ رَبَنَا وَبِحَمدِكَ اللهُمَّ اغفِرلِي/ مسلم وغير/ پاك‌و بێ عەیبی بۆتۆ ئەی خوایە، ئەی پەروەردگارمان وە لەگەڵ ئەوەشدا سوپاس بۆتۆ، ئەی خوایە لێم خۆشببە}.

## ١١١ سورەتی مەسد ٥

سورەتی مەسد لە مەکەدا هاتوەتە خوارەوەو پێنج ئایەتە.

ئیبنو عەباس دەڵێت پێغەمبەر ﷺ چوە سەر چیای ئەبوقوبەیس‌و بانگی کردە قورەیش: ئەی خەڵکینە، ئەوانیش هاتن‌و لێی کۆبونەوە، ئینجا پێی فەرمون: { أَرَأَيْتَكُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ خَيْلًا بِالْوَادِي تُرِيدُ أَنْ تُغِيرَ عَلَيْكُمْ أَكُنْتُمْ مُصَدِّقِيَّ قَالُوا نَعَمْ مَا جَرَّبْنَا عَلَيْكَ إِلَّا صِدْقًا قَالَ فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ / متفق عليه/ پێم بڵێن: ئەگەر من پێتان بڵێم کە ئەسپ سوارانێك لەوشیوەدا دەیانەوێ لەپڕدا بەسەرتاندا بدەن، ئایا باوەڕم پێدەکەن؟ ئەوانیش وتیان: بەڵێ، ئێمە جگە لە ڕاستی شتێکی ترمان لە تۆ نەدیوە، ئەویش فەرموی: دەی بێگومان من ترسێنەرم بۆتان لەپێش هاتنی سزایەکی بەهێز}

ئینجا ئەبولەهەب کە مامی بو لەناو ئەو خەڵکەدا هەڵساو وتی: ئایا تۆ بۆ ئەمە ئێمەت کۆکردوەوە، دەك لەناوچیت‌و ڕەنجەڕۆ بیت، ئەم پیاوە دەڵێن بەشوێن پێغەمبەردا ﷺ دەڕۆیشت‌و لەپشتیەوە دەوەستا تا قسەی بۆ خەڵك دەکرد، ئینجا دەیوت: درۆ دەکات‌و باوەڕی پێ مەکەن ئەوە برازای خۆمە من باشی دەناسم، تەنانەت دوو کچی پێغەمبەر ﷺ کە ڕوقیەو ئوم کەلسوم بون لەپێشدا هێنابونی بۆ دوو کوڕی خۆی، لە پاش ئەمە هەردووکی پێ تەڵاقدان تا زیاتر ئازار بە دڵی پێغەمبەر ﷺبگەیەنێت، وە خێزانەکەیشی ناوی (ئومو جەمیل)بو لە قسەی ناشیرین‌و تانەو تەشەردان لە پێغەمبەر ﷺ کۆتایی نەدەکرد، تەنانەت داروودڕکی دەهێناو لەڕێگای پێغەمبەردا ﷺدایدەنا تا ئازاری پێبگات، بەڵام پێغەمبەری دڵسۆزو ڕەوشت بەرز لەبەر ڕێزی مامیەتی لە هەمو قسەکانی خۆی کڕ دەکردو وەڵامی نەدەدایەوە، تا خوای خاوەن دەسەڵات‌و بەشکۆ ئەرکی وەڵامدانەوەی ئەبولەهەبی خستەسەر خۆی‌و فەرموی:

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) لەناوچوو ڕەنجەڕۆ بێت هەردوو دەستی ئەبولەهەب‌و ڕسوا بێت، وە بێگومان کە لەناوچوو ڕەنجەڕۆش بو، بەڵێ ئەبولەهەب وا ئێستا لەناو خەڵکدا هەڵس‌وکەوت دەکات، بەڵام ﷲ فەرموی: لەناوچوو.

(٢) ماڵ و منداڵ‌و ئەوەی کە بەدەستی هێنابو هیچ سوودێکی بەو نەداو فریای نەکەوت.

(٣) بەڵکو بەم زوانە دەخرێتە ناو ئاگرێکی خاوەن بڵێسەوە، چونکە ڕقوقینی ئەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبو و بڵێسەی دەسەندو نەدەکوژایەوە تا مرد جابە شێوەی کردارەکەی، بەڵام زۆر گەورەو گرانتر ئەو ئاگرەیش کە ئەوی تێ دەخرێت بە گڕو بڵێسەیەو هەرگیز ناکوژێتەوە،

(٤) وە ژنەکەیشی کە ناوی ئەروای کچی حەربی کوڕی ئومەیەو خوشکی ئەبوسوفیانە کە بە ئومو جەمیل ناسراوە، هەڵگری کۆڵەدارە بۆ زیاتر خۆشکردنی ئاگری مێردەکەی، واتە هەروەك چۆن لە دنیادا یارمەتی مێردەکەی دەدا لەسەر کوفرو دژایەتی ئیسلام‌و پێغەمبەر ﷺ هەروا لە ڕۆژی دوایش لەناو دۆزەخدا سەرەڕای سزای خۆی کۆڵەداری پێدەهێنرێت بۆ زیاتر بڵێسەدار کردنی ئاگری مێردەکەی‌و ئەمەش سەخت نیە لەلای ئەو زاتەی کە لەناو ئاگری دۆزەخدا درەختی شینکردوە، وەیان وتراوە مەبەست لە ﴿حَمَّالَةَ ٱلۡحَطَبِ﴾ واتە هەڵگری کۆڵەدار ئەو کەسەیە کە بۆ ئاژاوەنانەوە لەناوخەڵکدا قسە ئەملاولا پێدەکات کە لێرەدا خێزانەکەی ئەبولەهەب بەوە وەسف دەکات یان مەبەست ئەوەیە کە ژنەکەی چۆن لە دنیادا هەڵگری دارو دڕك

## سُورَةُ الإخلاص ١١٢ ٤

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدٌۢ ﴿٤﴾

## سُورَةُ الفَلَق ١١٣ ٥

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ ٱلنَّفَّٰثَٰتِ فِى ٱلْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾

## سُورَةُ النَّاس ١١٤ ٦

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ ٱلْوَسْوَاسِ ٱلْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ ٱلَّذِى يُوَسْوِسُ فِى صُدُورِ ٱلنَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ ٱلْجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ ﴿٦﴾

بو بۆ ئازاردانی پێغەمبەر ﷺ جالەو ڕۆژەشدا پەت دەخرێتەملی وەك دەفەرموێ:

﴿٥﴾ لە گەردنیدایە گوریسێكی دروستكراو لە ئاگری دۆزەخ، دەڵێن لە دنیادا گەردن بەنێكی چاكی هەبوە فرۆشتویەتی بۆ دوژمنایەتی پێكردنی پێغەمبەر ﷺ بۆیە خوا بەو شێوەیە تۆڵەی لێدەكاتەوە.

دیسان ئەمەش موعجیزەیەكی تری گرنگە كە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە ئەم قورئانە قسەی زاتێكە كە ئاگای لە ئایندەو سەرنجامی هەمو شت هەیە لەم سورەتەدا باس لەوە دەكات، كە ئەبولەهەبو خێزانەكەی دەخرێنە ناو ئاگرەوە، واتە باوەڕ ناهێنن و بە كافری دەمرن، كەچی هەروایش دەرچوو ئەمانە بە بێباوەڕی مردن، بەڵام ئەگەر پاش هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتانە ئیمانیان بهێنایە ئەوا ئەم ئایەتانە دەكەوتنە ژێر رەخنەو گومانەوەو بەم شێوەیش دەیان توانی بیسەلمێنن كە قسەی قورئان راست دەرنەچو كەواتە ئەوە قسەی ﷲ نیە، بەڵام ئومو جەمیل كاتێك زانی كە ئەم سورەتە هاتوەو ئەو ژنە ناودارە بە كۆڵ هەڵگر ناودەبات زۆر تورە بو و هاتو بەردێكی بەدەستەوەبو پێغەمبەر ﷺ كە ئەبوبەكری لەگەڵدابو دانیشتبو لەلای كەعبەدا هاتەلای ئەبوبەكرو بەسەریەوە وەستاو وتی: دەڵێن: هاورێكەت قسەی ناشیرینی پێ وتوین؟ ئەبوبەكریش وتی: نە بەخوای ئەم ماڵە هیچ هەڵبەستێكی نەوتوەو نەهاتوە بە دەمیداو وتی تۆ باوەڕپێكراویت، كاتێك گەڕایەوە ئەبوبەكر وتی: ئایا نەیبینیت؟ فەرموی نەخێر، فریشتەیەك دایدەپۆشیم هەتا گەڕایەوە (صحیح السیرة).

ئەم سورەتە كاتێك دابەزی كە پێغەمبەرو یارانی لە دژوارترین حاڵدا بون بەڵام دەربڕینی حەقو حەقیقەت پێویستە جا بۆیە پێغەمبەرانو شوێنكەوتوانیان لە هەر سەردەمێكدا بە راشكاوی بێزاریو رقو قینی خۆیان لە شیركو ئەهلەكەی دەرخستوەو بەرونی بانگەوازیان بۆ تەوحیدو یەكخوا پەرستی كردوەو پێش ئەوەی كە بتە مردوەكان لەناوبەرنو بیانشكێنن بتە زیندوەكانیان شكاندوەو بەیەكیاندا داون، هەروەها ئەم سورەتە ئەوەمان بۆ دەردەخات كە خزمایەتی نابێت بەهۆی خۆشبەختی یان بەدبەختی بەڵكو هەركەسێك لە بارمتەی كرداری خۆیدایە، ئەگەر چاكی كرد پاداشتی چاكە با هەمو كەسی خراپ بنو ئەگەر خراپی كرد پاداشتی خراپە با هەمو كەسیشی پیاوی چاك بن، ئەبولەهەب مامی پێغەمبەرمانە ﷺ ئەو سزا سەختەی هەیەو هەمزە مامیەتی گەورەی هەموشەهیدانەو ژنی فیرعەون بەهەشت جێگایەتیو هاوسەرانی نوحو لوت دۆزەخ جێگایانە، عەكرەمەی كوڕی ئەبوجەهل بۆ بەهەشت دەڕواتو كوڕی نوح لە دۆزەخدایە.

بەڵێ هەمومان لە دنیادا بەندەی خواین بەبێ جیاوازی، بەڵام لە پاداشتو سزادا بە هەزاران جیاوازی﴿ئەوسا هەركەس بە ئەندازەی زەڕەیەك چاكە بكات لە دنیادا لەوێ دەیبینێتەوەو پاداشتی وەردەگرێتەوە ئەگەر بە شتی تر بەتاڵ نەكردبێتەوە، وە هەركەسێكیش بە ئەندازەی زەڕەیەك خراپەی كردبێت دەیبینێتەوەو سزای وەردەگرێت ئەگەر چاوپۆشی لێ نەكرابێت﴾ الزلزلە: ٧-٨. بەراستی ئەم سورەتە یەكێكە لەو بەڵگە گەورانەی كەراستی و دروستی ئەم قورئانە دەسەلمێنێت چونكە خۆ كاتی هاتنی ئەم سورەتە ئەوژن پیاوەمابون بۆ نەیان توانی ئەگەر بەشێوەی منافقیش بوایە بەرواڵەت موسڵمان ببونایەو بیان وتایە ئەی محمد خۆ ئەوە ئێمە باوەڕمان هێناو قسەی خواكەت كەوت بەدرۆوە، جا ئەی مرۆڤ بیربكەرەوە لەداناییو زانای پەروەردگارت.

## سورەتی ئیخلاس ١١٢ ٤

سورەتی ئیخلاس كە بە سورەتی (تەوحید)یش ناوبراوە، لە مەكەدا هاتوەتە خوارەوەو چوار ئایەتە. ئوبەی كوڕی كەعب دەڵێت: بت پەرستانی مەكە وتیان: ئەی (محمد) باسی پەروەردگاری خۆتمان بۆ بكە، ﷲ ئەم سورەتەی ناردەخوارەوە.

لە گەورەییو ڕێزی ئەم سورەتەدا چەندین فەرمودەلە پێغەمبەرەوە ﷺ هاتوە، لەوانە ئەو فەرمودەیە كە ئەنەس باسی دەكاتو دەڵێت: پیاوێكی یارمەتیدەر ئیمامەتی بۆ دەكردن لە

مزگەوتی (قوباء)دا، جا هەر کاتێك سورەتێکی بخوێندایە پێشەکی ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ﴾ی دەخوێند، ئینجا ئەو سورەتەی تری دەخوێندو لە هەمو رکاتێکدا ئاوای دەکرد، هاورێکانی پێیان وت: تۆ بۆ هەمیشە بەم سورەتە دەست پێدەکەیت پاشان وادەزانی بەس نیە بۆیە سورەتێکی تر دەخوێنی یان هەر ئەم بخوێنە یان واز لەم سورەتە بهێنەو سورەتێکی تر بخوێنە؟ ئەویش وتی: من وازی لێ ناهێنم ئەگەر پێتان خۆشە بەو شێوە ئیمامەتیتان بۆ دەکەمو ئەگەر پێتان ناخۆشە واز لە ئیمامەتیتان دەهێنم، ئەوان بە چاکتر لە هەمویان تەماشایان دەکردو پێیان ناخۆش بو کەسێکی تر ئیمامەتیان بۆبکات بێجگە لەو، جا کاتێك هاتنەلای پێغەمبەر ﷺ ئەو هەواڵەیان پێدا، فەرموی:{ يَا فُلَانُ مَا يَمْنَعُكَ أَنْ تَفْعَلَ مَا يَأْمُرُكَ بِهِ أَصْحَابُكَ وَمَا يَحْمِلُكَ عَلَى لُزُومِ هَذِهِ السُّورَةِ فِي كُلِّ رَكْعَةٍ فَقَالَ إِنِّي أُحِبُّهَا فَقَالَ حُبُّكَ إِيَّاهَا أَدْخَلَكَ الْجَنَّةَ /البخاری/ واتە: فلان کەس چ شتێك بەرگریت لێدەکات لەوەی کە بەگوێی هاورێکانت بکەیت؟ وە چی وای لە تۆ کردوە کە لە هەمو کاتێکدا تۆ ئەو سورەتە بخوێنی؟ وتی: بەڕاستی من ئەو سورەتەم خۆشدەوێت، فەرموی: خۆشەویستی تۆ بۆ ئەو سورەتە دەتخاتە بەهەشتەوە} هەروەها پێغەمبەرمان ﷺ فەرمویەتی:{ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ إِنَّهَا لَتَعْدِلُ ثُلُثَ الْقُرْآنِ / متفق علیه/ سوێند بەو زاتەی کە گیانی منی بەدەستە ئەم سورەتە بەشێکە لە سێ بەشی قورئان} وە سونەتە لەکاتی خەوتندا لەگەڵ سورەتی فەلەقو سورەتی ناسدا بخوێنرێت، هەروەها سونەتە پاش هەمو نوێژەکان بخوێنرێت.

بەناوی ﷲ ی زۆر بەسۆز و بێنیهایەت میهرەبان

(١) بڵێ ئەو پەروەردگارەی من تاکەو وێنەی نیە، هەمو وەسفانی جوانو تەواو هەر هی ئەوە کە لە هیچ کەسی تردا بەدینایەت.

ﷲ (٢) لەوپەڕی گەورەیدایە و هەمو شت نیازی بەو هەیەو ئەو نیازی بە کەس نیەو، کار دەکاتەسەر هەمو شتێكو هیچ شتێك کاری تێناکات.

(٣) نە کەسی لێ بوە تا شتێك لەو بچێت وە نە لە کەسیش بووە تا بە کەسێك بچێت کەواتە

(٤) هیچ کەسێك هاوتاو هاووێنەی ئەو نیە، جا ئەگەر بەباشی تەماشای بکەین دەبینین ئەم سێ ئایەتەی دوایی مانای ئایەتی یەکەمە کە خوا تاکە لە زاتیداو تاکە لە سیفاتیداو تاکە لە کرداریدا، وە لە هیچ کامیاندا وێنەی نیەو کەس بەو ناچێت، لێرەدا هەروەکو تاكو تەنیایی ﷲ دەسەلمێنێت بەو چەند ئایەتە ئەوەشمان تێدەگەیەنێت کە خاوەنی وەسفانێکی سەلمێنراوو دامەزراوە (الصفات الثبوتیة) وەکو وشەی "الصمد" واتە گەورەو پەنا پێ براوو لاڵە ئەلا کراوو بێنیازێك کە هەمو بەو نیازی هەیە، وە خاوەنی سیفاتێکە کە دورن لەوزاتە (الصفات المنفیه) وەکو نەبوونی منداڵو هاوسەرو باوكو دایك کە وشەکانی ﴿لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ﴾ ئەوە دەگەیێنێت، وە نیسبەتدانی خوا لەو وەسفە تاوانێکی گەورەیە وەکو لە سورەتی (مریم)دا دەفەرموێت: ﴿وەئەوان ئەڵێن: (ﷲ) منداڵی هەیە.

بەراستی قسەیەکی زۆر گەورەو خراپتان کردووە ئەوەندە گەورەو خراپە کە ئاسمانەکان لە داخی ئەو قسەیەی کە ئێوە دەیکەن خەریکن لەت لەتوگاڵگاڵ ببن،وە زەوییش خەریکە پارچە پارچە ببێتو چیاکان خەریکن لەتو پەت ببن وبکەونە خوارەوە، لەبەر ئەو تاوانە گەورەی کە ئێوە ئەڵێن رەحمان منداڵی هەیە، کە رەحمان پێویستی بەمنداڵ نیە ونەگونجاویشە، چونکە هیچ شتێك نیە نەلە ئاسمانانو نەلە زەویدا مەگەر لە رۆژی قیامەتدا دێتە خزمەت (ﷲ)و دان بە بەندایەتی خۆیدا دەنێت﴾

دەی بەندە چۆن دەکات بەمنداڵو هاوشانی خۆی؟ وە دەبێت بەهیچ شتێك نەچوێنرێت،چونکە هیچ شتێك وەکو ئەو نیە وەکو لە سورەتی (الشوری)دا دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾ هەربۆیە لە سورەتی (النحل)دا هەڕەشەی لەو کەسانە کرد کە وێنە بۆ خوا دادەنێنو فەرموی: ﴿فَلَا تَضۡرِبُواْ لِلَّهِ ٱلۡأَمۡثَالَ﴾. وشەی (احد) واتە تاك کەلە گەڵ وشەی "واحد" واتە یەك جیاوازی هەیە، چونکە لە وشەی واحد گومانی دووهەمیش دەکرێت، جابۆیە هەرکات ئەم وشەیە هاتبێت پاش ئەو رەدی ئەوەدەکاتەوە کە خوایەکی تر ببێت.

بورەیدەی ئەسلەمی دەڵێت پێغەمبەر ﷺ گوێی لە دوعای پیاوێك بو کە دەیوت: (اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ بِأَنِّي أَشْهَدُ أَنَّكَ أَنْتَ اللَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ الْأَحَدُ الصَّمَدُ الَّذِي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُوًا أَحَدٌ قَالَ فَقَالَ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَقَدْ سَأَلَ اللَّهَ بِاسْمِهِ الْأَعْظَمِ الَّذِي إِذَا دُعِيَ بِهِ أَجَابَ وَإِذَا سُئِلَ بِهِ أَعْطَى /الترمذي، صححه الألباني/ ئەی خودایە دەوات لێدەکەم بەهۆی ئەوەی کە شایەتی دەدەم کە بێگومان تۆ خوایەکیت کە جگە لە تۆ هیچ پەرستراوێکی راستەقینەی تر نیە کە ئەوکەسە تاكو بێنیازەیت کە نە منداڵی هەیەو نە لەکەس بووەو نەهاوشانێکی هەیە، جا پێغەمبەرﷺ فەرموی: سوێند بەو کەسەی کە گیانی منی بەدەستە بەو ناوە گەورەی

داوای لێکرد کە، ئەگەر بەوە بانگ بکرێت وەڵام دەداتەوەو ئەگەر بەوەش داوای لێبکرێت دەبەخشێت)

١١٣ سورەتی فەلەق ٥

زۆربەی زانایان پێیان وایە سورەتی فەلەق لە مەکەدا دابەزیوە، هەندێکیش دەڵێن لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە، ئەم سورەتە سەدو سیانزەهەمین سورەتی قورئانەو بەگوێرەی دابەزین لەسەر رای ئەوانەی کە ئەم سورەتە بە مەکەیی دەزانن بیستەمین سورەتە کە لە پاش سورەتی (الفيل)و پێش سورەتی (الناس) دابەزیوەو پێنج ئایەتە.

خوێندنی ئەم سێ قولانە﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ ﴾و﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ و﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ لەپاش هەمو نوێژێکی فەرزو لەکاتی خەوتندا سونەتن وفەرمودەی راستیان لەسەرهاتوە، لەبارەی ئەم سورەتەو سورەتی (الناس) کە هەردووکیان بە (مُعَوِّذَتَين) بەناوبانگن چەند فەرمودەی ڕاست هاتوە لە وانە ئەم فەرمودەیە کە پێغەمبەرمان ﷺ بە عوقبەی کوڕی عامری فەرمو: ئەی عوقبە ئایا دوو سورەتت فێرنەکەم کە یەکێکە لە باشترینی هەردوو سورەتێکی تر کە خەڵك خوێندویەتی؟ وتم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، جا ئەویش ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ﴾ی بۆ خوێندمەوە، لەپاشان قامەتکرا بۆ نوێژ پێغەمبەری خوا ﷺ هەستا چوە پێشەوەو ئەم دوو سورەتەی خوێندەوە، لەپاشان دای بەلامداو فەرموی: چۆنت بینی ئەی عوقبە؟ هەردووکیان بخوێنە هەرکاتێك هەستای لە خەو (احمد، النسائي، صحح الالباني) .

هەروەها ئیمامی موسلم هەر لە عوقبەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی :{أَلَمْ تَرَ آيَاتٍ أُنْزِلَتْ اللَّيْلَةَ لَمْ يُرَ مِثْلُهُنَّ قَطُّ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾ واتە ئایا تۆ نازانیت کە ئەم شەو چەند ئایەتێك دابەزیوە هەرگیز وێنەی ئەو نەبینراوە ئەوانیش بریتین لە ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلۡفَلَقِ ﴾ و ﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴾}.

بەناوی اللهﷻ ی زۆربەسۆزو بێنهایەت میهرەبان

(١) بڵێ من پەنا دەگرم بەخوای شەفەقەرو دەرهێنەری هەمو شتێك بەتایبەتی هێنانی ڕوناکی بەیانی بەدوای شەوداو پاڵنانی تاریکی کە کاتێکی زۆر بەپیتو بەرەکەتە بۆ مرۆڤ، پەنا دەگرم بەو پەروەردگارە بەهێزو خاوەن دەسەڵاتە کە ئەو گۆڕانکاریە سەرسوڕهێنەرە دروست دەکات بەبێ ئەوەی ماندو ببێت.

(٢) لە شەڕی هەمو شتێك کە دروستی کردوە. کە شەڕی شەیتانو سزای دۆزەخیشی بەردەکەوێت، چونکە ئەوانیش هەر دروستکراوی خودان واتە: وشەیەکی زۆر پڕ مانایەو ئەوانەی دوایی کە دێن تایبەتترن، وەکو دەفەرموێ:

(٣) وە پەنادەگرم بەو پەروەردگارە لە شەڕی شەو کاتێك کە تاریك دەبێت، چونکە کاتی بڵاوبونەوەی هەمو گیان لەبەرێکی پڕ مەترسیەو کاتی بڵاوبونەوەی بەدکارانە، جا جێگای خۆیەتی کە مرۆڤ لە شەڕی ئەوانە خۆی بەو زاتە بپارێزێت کە هەمو کەس بە ئیرادەو هێزی ئەو دەتوانن شت بکەنو بێ ئیرادەی ئەو توانای هیچیان نیە.

دایکی باوەڕداران عایشە دەڵێت: پێغەمبەرﷺ تەماشای مانگی کرد ئینجا فەرموی: { يَا عَائِشَةُ اسْتَعِيذِي بِاللَّهِ مِنْ شَرِّ هَذَا فَإِنَّ هَذَا هُوَ الْغَاسِقُ إِذَا وَقَبَ/ الترمذي، صححه الألباني/ ئەی عایشە پەنابگرە بە اللهﷻ لەشەڕی ئائەمە کە بەراستی ئەوە ئەو تاریکییەیە کە دێت} ئینجا دەفەرموێ:

(٤) وە لە شەڕی ئەو ئافرەتە ساحیرانە کاتێك کە فوودەکەن بەگرێکاندا بۆ سیحرو جادوگەریو تێکدانی ژیانی خەڵك، ئینجا باسی زیان دەرێکی تر دەکاتو دەفەرموێ:

(٥) سا پەنادەگرم بەخوای فەلەق لە شەڕی حەسودیش هەرکاتێك کە حەسادەت دەبات. چونکە ئەو حەسادەتەیش دیسان کار دەکاتە سەر ژیریو ماڵو لەشو گیانی مرۆڤ دیارە بەمەیلوئیجازەی اللهﷻ، جا ئەو کەسەی کە بزانێت قسەکانی کاردەکاتە سەر خەڵك پێویستە خۆی لە قسەو باسکردنی خەڵك بپارێزێت، هەر کاتێکیش ویستی باسی کەسێك بکات با بڵێ (ماشاء الله) ئینجا ئەو قسەیەی کە دەوێ بیکات با بیکات، ئەوکات بە ویستی پەروەردگار زیانی نابێت.

١١٤ سورەتی ناس ٦

سورەتی ناس زۆربەی زانایان پێیان وایە لە مەکە دابەزیوە، هەندێکیش دەڵێن لە مەدینەدا هاتوەتە خوارەوە ئەم سورەتە دواین سورەتی قورئانە، وەبەگوێرەی دابەزین لەسەر رای ئەوانەی کە ئەم سورەتە بە مەکەیی دەزانن بیستو یەکەمین سورەتە کە لە پاش سورەتی (الفلق)و پێش سورەتی (الإخلاص) دابەزیوەو شەش ئایەتە، لەبارەی ڕێزی ئەم سورەتەوە ئەوەی کەلە سورەتی (الإِخْلاَص)و (الْفَلَق)دا باسکرا بەسە. ئەم سورەتەلەسەر قسەی ئەوکەسانە کەبەمەدینەیی دەزانن لەگەڵ

سورەتی فەلەق دا دابەزیوە، کە هۆی دابەزینیان ئەوە بو کە کابرایەکی جولەکە بەناوی لەبیدی کوڕی ئەعصەم لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺ دا جادوی لە پێغەمبەرمان کردوەو ئازاری پێ گەیاندوە، بەڵام لە ئازاردان بەولاوە کارێکی تری پێ نەکراوە، جا ئەم سیحرە شەش مانگی خایاندوە وەکو ئیمام ئەحمەدو بوخاریو موسلم بۆمان دەگێڕنەوە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە جادو بەئیرادەی خوا کاردەکاتە سەر لاشەو بیرو هۆش، باش وایە کە جادولێکراو ئەم سورەتە زۆر بخوێنێ بەڵکو ﷲ پاڕانەوەکەی لێ وەربگرێتو شیفای بدات. دایکی باوەڕداران عایشە دەڵێت: { أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ كَانَ إِذَا اشْتَكَى نَفَثَ عَلَى نَفْسِهِ بِالْمُعَوِّذَاتِ وَمَسَحَ عَنْهُ بِيَدِهِ/ متفق عليه/ واتە: پێغەمبەرﷺ هەرکات شوێنێکی ئێشی بکردایە سورەتی فەلەقو ناسی دەخوێندەوەو فوی دەکردو دەستی دەهێنا بەخۆیدا} وەهەروەها پێغەمبەرمان ﷺ لەبارەی ئەم دوسورەتەوە فەرمویەتی:{ مَا تَعَوَّذَ النَّاسُ بِأَفْضَلَ مِنْهُمَا/ النسائي، صححه الألباني/ خەڵك بە شتێکی چاکتر لەم دوو سورەتە داوای پەنای لە ﷲ نەکردوە. }

بەناوی ﷲ ی زۆربەسۆزو بێنیهایەت میهرەبان

(١) بڵێ: پەنادەگرم بە پەروەردگاری خەڵك.

(٢) بەپادشاو خاوەنی خەڵك.

(٣) پەنادەگرم بە مەعبودو پەرستراوی ڕاستەقینەی خەڵك، لە چی؟

(٤) لە شەڕو خراپەی ئەوەی کە زۆر خورپە دروستکەرو گەڕاوەیە واتە: هەمیشە هەر خەریکی دروستکردنی خورپەی خراپە لەناو دڵی مرۆڤداو هەر کاتێك یادی ﷲ بکرێت ئەوە دەگەڕێتەوەو دەردەچێتو هەر کە بێ ئاگایی لەﷲ پەیدابو دێتەوەو خورپە دروست دەکات، کەواتە زۆر دێتو دەڕوات، کە جێگای ئەم خورپەو هاتوچۆیە دڵە کە لەناو سینگی مرۆڤدایە، بۆیە دەفەرموێ:

(٥) ئەوەی کە خورپە دروست دەکات لەناو سینگی خەڵکدا، مەبەست لە سینگ دڵی ناو سینگە، جا هەروەکو ڕوونە ئەو خورپانە لە دڵی نەوەی ئادەمدا دروست دەبێت دەشگونجێت لە دڵی جنۆکەکانیشدا دروست ببێتو ئەو شتەیش کە ئەو خورپانە دروست دەکات و بە یادی خوا دەتۆرێتو ڕادەکات. پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: {إِنَّ الشَّيْطَانَ يَجْرِي مِنْ ابْنِ آدَمَ مَجْرَى الدَّمِ /متفق عليه/ بەراستی کە شەیتان هاتوچۆ دەکات لە لەشی مرڤدا لەوشوێنەی کە خوێن هاتو چۆی پێدادەکات}

(٦) لە جنۆکەو لە نەوەی ئادەمە. واتە تاقمێکی جنۆکەو تاقمێکی مرۆڤ ئەو وەسفە خراپەیان هەیەو پێویستە مرۆڤ ئاگای لەخۆی بێت پێشەکی بۆ پاراستنی لە شەڕی هەردووکیان پەنا بەﷲ بگرێت هەر بەو پەناگرتنە دەپارێزرێت لە شەڕی جنۆکە، بەڵام بۆ خۆپاراستنی لە شەیتانی نەوەی ئادەمی پێویستە سەرەڕای پەناگرتن بەﷲ لە شەڕیان بە ڕواڵەتیش دەبێت خۆی تێکەڵاوی مرۆڤی شەیتان سیفەت نەکات، پێغەمبەرمان ﷺ دەفەرموێ: مرۆڤ لەسەر ئایینی برادەرەکەیەتی، جا با بزانێت برادەریو دۆستایەتی کێ دەکات، واتە ئەگەر خۆتت خۆشدەوێتو دەترسیت لە پەروەردگارتو لە پاشەڕۆژی خۆت دۆستایەتی و تێکەڵاوی مرۆڤی خراپو شەیتان سیفەتان نەبیت، بەراستی ئەمەیان مەترسی زیاترە، چونکە دەیناسیتو خزمەتو هاوزمانتەو هاورێتەو شەرم دەکەیت دڵی بشکێنی، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو لە ڕوخاندنو نەهێشتنی بیروباوەڕی تۆدا درێغی ناکات. سوپاس بۆ خوا شەیتانی جنۆکە هەر خورپەی لەدەست دێتو بە یاد کردنێکی ﷲ ڕاودەکرێتو دەتارێنرێت، دەگێڕنەوە لە ئیبنوعەباسەوە کە پیاوێك هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ من نەفسم خورپەی وام بۆ دروست دەکات کە ئەگەر لە ئاسمانەوە فڕەبدرێمە خوارەوە ئەوەم پێخۆشترە تا ئەوەی کە ئەو قسە بکەم، ئیبنوعەباس دەڵێت: پێغەمبەر ﷺ فەرموی: {اللَّهُ أَكْبَرُ اللَّهُ أَكْبَرُ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي رَدَّ كَيْدَهُ إِلَى الْوَسْوَسَةِ /ابوداود، صححه الألباني/ خوا لە هەموکەس گەورەترە، خوا لە هەموکەس گەورەترە سوپاس بۆ خوا کە هەمو فڕوفێڵەکەی کردوە بە خورپەو هیچی تر}

چاوپێداخشاندنەوەی بۆ چاپی دووهەم تەواو بو لەرێکەوتی بیستوپێنجی ڕەجەبی/ هەزارو چوارسەدو سیو شەشی کۆچی بەرانبەربە چواردەی پێنجی دووهەزارو پانزەی زاینی. هەولێر.  ولله الحمد والمنه

# فهرس پێڕست


| ژماره | ناو | لاپەره |
|---|---|---|
| أ | مقدمة | 1 |
| ١ | الفاتحة | 18 |
| ٢ | البقرة | 29 |
| ٣ | آل عمران | 135 |
| ٤ | النساء | 186 |
| ٥ | المائدة | 231 |
| ٦ | الأنعام | 269 |
| ٧ | الأعراف | 304 |
| ٨ | الأنفال | 342 |
| ٩ | التوبة | 361 |
| ١٠ | يونس | 393 |
| ١١ | هود | 408 |
| ١٢ | يوسف | 436 |
| ١٣ | الرعد | 444 |
| ١٤ | إبراهيم | 452 |
| ١٥ | الحجر | 462 |
| ١٦ | النحل | 469 |
| ١٧ | الإسراء | 486 |
| ١٨ | الكهف | 505 |
| ١٩ | مريم | 522 |
| ٢٠ | طه | 535 |
| ٢١ | الأنبياء | 549 |
| ٢٢ | الحج | 560 |
| ٢٣ | المؤمنون | 573 |
| ٢٤ | النور | 582 |
| ٢٥ | الفرقان | 595 |
| ٢٦ | الشعراء | 603 |
| ٢٧ | النمل | 616 |
| ٢٨ | القصص | 624 |
| ٢٩ | العنكبوت | 635 |
| ٣٠ | الروم | 643 |
| ٣١ | لقمان | 650 |
| ٣٢ | السجدة | 654 |
| ٣٣ | الأحزاب | 657 |
| ٣٤ | سبإ | 669 |
| ٣٥ | فاطر | 674 |
| ٣٦ | يس | 680 |
| ٣٧ | الصافات | 686 |
| ٣٨ | ص | 694 |
| ٣٩ | الزمر | 701 |
| ٤٠ | غافر | 710 |
| ٤١ | فصلت | 720 |
| ٤٢ | الشورى | 726 |
| ٤٣ | الزخرف | 732 |
| ٤٤ | الدخان | 741 |
| ٤٥ | الجاثية | 745 |
| ٤٦ | الأحقاف | 749 |
| ٤٧ | محمد | 754 |
| ٤٨ | الفتح | 758 |
| ٤٩ | الحجرات | 763 |
| ٥٠ | ق | 767 |
| ٥١ | الذاريات | 771 |
| ٥٢ | الطور | 774 |
| ٥٣ | النجم | 777 |
| ٥٤ | القمر | 781 |
| ٥٥ | الرحمن | 785 |
| ٥٦ | الواقعة | 789 |
| ٥٧ | الحديد | 794 |
| ٥٨ | المجادلة | 800 |
| ٥٩ | الحشر | 806 |
| ٦٠ | الممتحنة | 811 |
| ٦١ | الصف | 815 |
| ٦٢ | الجمعة | 818 |
| ٦٣ | المنافقون | 820 |
| ٦٤ | التغابن | 822 |
| ٦٥ | الطلاق | 825 |
| ٦٦ | التحريم | 830 |
| ٦٧ | الملك | 832 |
| ٦٨ | القلم | 835 |
| ٦٨ | الحاقة | 839 |
| ٦٩ | المعارج | 842 |
| ٧١ | نوح | 844 |
| ٧٢ | الجن | 847 |
| ٧٣ | المزمل | 850 |
| ٧٤ | المدثر | 852 |
| ٧٥ | القيامة | 855 |
| ٧٦ | الإنسان | 858 |
| ٧٧ | المرسلات | 861 |
| ٧٨ | النبأ | 864 |
| ٧٩ | النازعات | 867 |
| ٨٠ | عبس | 871 |
| ٨١ | التكوير | 874 |
| ٨٢ | الانفطار | 877 |
| ٨٣ | المطففين | 879 |
| ٨٤ | الانشقاق | 883 |
| ٨٥ | البروج | 885 |
| ٨٦ | الطارق | 889 |
| ٨٧ | الأعلى | 891 |
| ٨٨ | الغاشية | 893 |
| ٨٩ | الفجر | 895 |
| ٩٠ | البلد | 898 |
| ٩١ | الشمس | 900 |
| ٩٢ | الليل | 901 |
| ٩٣ | الضحى | 903 |
| ٩٤ | الشرح | 905 |
| ٩٥ | التين | 906 |
| ٩٦ | العلق | 907 |
| ٩٧ | القدر | 910 |
| ٩٩ | البينة | 911 |
| ٩٩ | الزلزلة | 913 |
| ١٠٠ | العاديات | 914 |
| ١٠١ | القارعة | 915 |
| ١٠٢ | التكاثر | 916 |
| ١٠٣ | العصر | 917 |
| ١٠٤ | الهمزة | 918 |
| ١٠٥ | الفيل | 919 |
| ١٠٦ | قريش | 921 |
| ١٠٧ | الماعون | 922 |
| ١٠٨ | الكوثر | 923 |
| ١٠٩ | الكافرون | 924 |
| ١١٠ | النصر | 925 |
| ١١١ | المسد | 926 |
| ١١٢ | الإخلاص | 927 |
| ١١٣ | الفلق | 929 |
| ١١٤ | الناس | 930 |